۱ واکه (مصوت)ها

| واکه | نشانه‌ی آوایی | مثال | آوانگاری |
|---|---|---|---|
| ـــَــ (فتحه) | a | دَست | dast |
| ـــِــ (کسره) | e | دِل | del |
| ـــُــ (ضمّه) | o | گُل | gol |
| ا، ـــا، ی | ā | رام | rām |
| | | بار | bār |
| | | کُبری | kobrā |
| ـــیــ ، ـــی | î | شیر | šîr |
| | | باری (باربر) | bārî |
| ـــیــ (کوتاه) | i | بلیت | bilît |
| ی (کشیده) | i: | باری (به‌هرحال) | bāri: |
| ـــو | û | نور | nûr |
| ـــو (کوتاه) | u | فروش | furûš |
| ـــُ (ضمه‌ی کشیده) | o: | پُلو | polo: |
| اَو | ow | پُلَو | polow |

## ۲. همخوان‌ها(حروف بی‌صدا)

| همخوان | نشانه‌ی آوایی | نمونه | آوانگاری |
|---|---|---|---|
| ب | b | بار | bār |
| پ | p | پا | pā |
| ت ، ط | t | تار | tār |
| | | طبل | tabl |
| ث ، س، ص | s | ثبت | sabt |
| | | سال | sāl |
| | | صدا | sedā |
| ج | c | جوان | cavān |
| چ | č | چمن | čaman |
| ح ، ه | h | حرف | harf |
| | | هما | homā |
| خ | x | خوب | xûb |
| د | d | درس | dars |
| ذ ، ز ، ض ، ظ | z | ذهن | zehn |
| | | زیبا | zibā |
| | | ضَرب | zarb |
| | | ظُلم | zolm |
| ر | r | راه | rāh |
| ژ | j | ژاله | Jāle |
| ش | š | شیر | šîr |

| همخوان | نشانه‌ی آوایی | نمونه | آوانگاری |
|---|---|---|---|
| غ ، ق | q | غار | qār |
| | | قند | qand |
| ف | f | فردا | fardā |
| ک | k | کاخ | kāx |
| گ | g | گُرگ | gorg |
| ل | l | لاک | lāk |
| م | m | ماه | māh |
| ن | n | نان | nān |
| و | v | وزن | vazn |
| ی | y | یاد | yād |

### ۳. حروف همخوان /ء/ و /ع/

همـزه و عـین در زبـان فارسـی تلفـظ یکـسان دارنـد و در ایـن کتـاب بـا نشانه‌ی /'/ آوانگـاری شـده‌انـد؛ماننـد: اَلَـم (درد و رنـج) و عَلَـم (پـرچم)؛ کـه هر دو «'alam» خوانده می‌شوند.

| حرف | نشانه‌ی آوایی | نمونه | آوانگاری |
|---|---|---|---|
| ء | ' | شیء | Šey' |
| أ | | أرز | 'arz |
| ـأ | | مأنوس | ma'nûs |
| ؤ | | رؤیا | ro'yā |
| ئـ | | رئوف | ra'ûf |
| ع | | عَکس | 'aks |
| | | عِلم | 'elm |
| | | عُرف | 'orf |
| | | عود | 'ûd |
| | | سعید | sa'îd |
| | | فعّال | fa''āl |
| | | وسیع | vasî' |

باید توجه داشت که هجا هیچگاه با واکه (مصوت) شروع نمی‌شود. بـه عبـارت دیگر سَرِ هجا باید حرف همخوان (صامت) باشد. از این روست که صداها اگـر در ابتدای واژه قرار گیرند، با همزه (کوتاهترین همخوان از نظر کشـشی) خوانـده مـی‌شـوند. ماننـد: آسـان ('āsān)، اَبـر('abr)، ایـن ('în)، اِسـم('esm) ، او('û)، و اُنس('ons).

## نشانه‌های به کار رفته در این فرهنگ

| نشانه | کاربرد |
|---|---|
| . (نقطه) | پایان سرواژه، پس از جایگاه دستوری |
| ؛ (نقطه‌بند) | بین کلمات و گاهی عبارات مترادف |
| ، (ویرگول) | توقف کوتاه |
| : (دو نقطه) | قبل از ریشه‌ی واژه و برای توصیف |
| [ ] (کروشه) | ریشه‌ی لغت |
| / / (کروشه خوابیده) | حوزه‌ی معنایی |
| ( ) (کمان) | توضیح بیشتر |
| ☜ | ارجاع یک واژه به واژه‌ی دیگر |
| ‹ › | شاهد یا مثال به کار رفته در تعریف‌ها |
| // // | صرف مصدر |
| / / | جدا کردن تلفظ و نشانه‌ی جمع |
| / | یا |
| ❋ | مترادف بودن یک واژه با همه‌ی تعریف‌ها |
| ▣ | زیر مدخل فعلی |
| ◙ | زیر مدخل اسمی |
| □ | جدا کردن تعریف مصدرهای لازم و متعدی |
| ! | تعجب، خطاب، تأکید |
| ؟ | پرسش |
| ■ | صفت فاعلی، صفت مفعولی و مصدر منفی، در پایان مصدرها |
| - - | جمله‌ی معترضه |
| - | بین اجزای برخی ترکیب‌ها |

# آ

**آ**[1] / 'ā/: *حرف.* ئا: ۱. هەوەڵین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی؛ ئەم نیشانەیە لە بناغەدا دوو پیتە: «ئـ» و «ا»، کە لە ڕێنووسی کوردیدا جیا کراونەتەوە و گرفتێکی زۆری لابردووە ۲. *[مخفف،گفتاری]* ئاغە؛ کا ‹آتقی: ئا تەقی›.

**ـــا**[2]: *میانوند.* ۱. ـــا؛ ـام؛ ـان؛ نیشانەی پێوەندی ‹سراپا؛ برابر؛ سراسر: سەراپا؛ بەرامبەر؛ سەرانسەر› ۲. ـــا؛ ـاو؛ ـای؛ نیشانەی چۆناوچۆنی ‹دمادم: دەماودەم› ۳. *[ادبی]* با؛ دەبا؛ یاخوا؛ نیشانەی داخواز و دۆعا و ئاواتخوازی ‹بمانـاد: با بمێنێت›.

**ـا**[3]: *پسوند.* ۱. ـــا؛ ـایی؛ ـەی؛ ـای؛ ـی؛ ناوساز ‹پهنا: پانا› ۲. ـا؛ ئاوەڵناوساز؛ لەگەڵ ڕەگی کرداردا ‹بینا؛ شنوا: بینا؛ ژنەوا› ۳. جێگری دووسەر(ً) لە وشە ڕەگەز عەرەبیەکاندا، بە مانای قەت، هەرگیز ‹ابداً؛ اصلاً؛ مطلقا› ٤. *[ادبی]* ـا؛ ئەی؛ نیشانەی بانگهێشتن ‹خداوندا؛ برادرا: خوایا؛ ئەی برا› ٥. *[ادبی]* ـۆ؛ ـا؛ ئەی؛ بەهـ ؛ حەی؛ نیشانەی پەسندان، سەرسووڕمان یان پێناخۆش بوون ‹دریغا: دەردو›.

**آئورت** / 'ā'ort، ـها/: [از فرانسوی] *اسم.* ئائۆرت؛ سوورە دەماری هەرەگەورەی لەشی بربڕەداران.

**آئین** / 'āîn/ ☜ **آیین**

**آئین‌بندی** / 'āînbandî/ ☜ **آیین‌بندی**

**آئین‌نامه** / 'āîn.nāme/ ☜ **آیین‌نامه**

**آئینه** / 'āîne/ ☜ **آیینه**

**ـ آئینی** / 'āînî/ ☜ **ـ آیینی**

**آب** / 'āb/: *اسم.* ۱. ئاو؛ یاو؛ ئاوی؛ ئاڤ؛ ئەو؛ تراوێکی ڕوون، بێڕەنگ، بێتام و بێبۆیە کە بە هۆی بارین یان توانەوەی بەفر و سەهۆڵ بەدیدێت ۲. ئاو؛ ئاوی؛ ئاڤ؛ ئەو تراوەی کە زەریا و چۆم و کانی بەدی هێناوە ۳. ـها *[مجازی]* زەریا؛ چۆم؛ چەم؛ ڕۆ؛ ڕۆبار؛ ڕووبار؛ هانە؛ کانی؛ گۆم؛ گم ٤. ئاو؛ ئاڤ؛ ئاوێ کە شتێکیان تێدا کوڵاندووە ‹آب‌گوشت: ئاوگۆشت› ٥. ئاو؛ ئاڤ؛ شیلە یا ئاوی میوە و سەوزی ‹آب کاهو: ئاو کاهوو› ٦. ئاو؛ ئاڤ؛ ئاوی؛ ئاوێ کە میوە یا گیایەکی تێدا دەخووسێنن ‹آب انجیر: ئاو هەنجیر› ۷. ئاو؛ ئاڤ؛ ئاوی؛ تراوێ کە بەهۆی تێکەڵ بوونی شتێک لەگەڵ ئاودا درووس دەبێت ‹آب‌نمک: ئاوخوێ› ۸. ئاو؛ ئاڤ؛ ئاوی کانزایەک کە لە ئاوکاریدا بەکار دێ ‹آب نقره: ئاوی زێو› ۹. *[گفتاری]* ئاو؛ یەکەی شۆردن ‹یکی دو آب کە بشویی،

اندازەات می‌شود: یەکــ دوو ئـاو بیشۆی، دەبێتە ئـەنـدازەت› ١٠. ئـاو؛ یـەکـەی چێشت لێنان ‹بایـد دو آب بجوشانی: ئـەشـێ دوو ئـاو بیکولـێنی› ١١. ئـاو؛ ئـاڤ؛ تـراوێ کـە لـە لـەش دێتـە دەرەوە ‹آب بینـی: ئـاوی لـووت› ١٢. ئـاب؛ مـانگی هـەشـتەمـی سالـی زایـینی لـە ولاتـە عـەرەبـەکـان، بـەرانبـەر بـە مـانگی ئـووت/ ئاگوست ١٣. ئاب؛ مـانگی یـازدەهـەمـی سالـی عـورفی و مـانگی پێنجـەمـی سالـی دیـنی جوولەکە.

▣ **آب آلوده:** شلوێ؛ لیخناو؛ لێلاو؛ گەنکاو.

**آب آهک** ☜ **آب‌آهک**

**آب اکسیژن** ☜ **آب‌اکسیژنه**

**آب امالـه:** ئـاو عیمالـە؛ ئـاوی سـابوون یـان ڕۆنی بـادام کـە بـۆ چـاری زگ بـەسـتن بکرێتە ناو ڕێڵەخۆوە.

**آب انجیـر:** ئـاو هـەنجـیر: ١. هـەنجـیراو؛ ئاوێـک کـە هـەنجـیری وشـکی تێـدا ئـەخووسـێنن ٢. *[نامتـداول]* شـیلە یـا ئـاوێ کە لە گووشاندنی هەنجیر بەدەس دێت.

**آب انگـور:** ١. ئـاوی تـرێ؛ ئـاو هـەنگـوور؛ ئاوێـک کـە لـە گووشـینی تـرێ بـەدی دێ ٢. *[مجـازی]* حـەرامـەشـەربـەتـاو؛ خواردنەوەی ئەلکولی.

**آب ایستاده** ☜ **آب راکد**

**آب باتری:** ئاو ئەسـید؛ ئـاو بـاتری؛ تێکـەڵـی ئاو و ئەسید سـوولفۆریک کـە بـۆ پیلـی تـەڕ بەکاردێ.

**آب بـاران:** بارانـاو؛ باروونـەو؛ وارانـاوی؛ ئـاوی باران.

**آب باریک** ☜ **آب‌باریکه**

**آب بینـی:** ١. چـڵـم؛ کـڵـم؛ چۆڵـم ٢. خـوڕ؛ ئاو لووت؛ تـراوێ کـە کـاتی درم و پـەتا بـە لووتدا دێ.

**آب پـاک:** *[اسـلام]* ئـاو پـاک؛ ئـاوی پـاکژ؛ ئـاوی پـاقژ؛ ئـاوە پوختـە؛ ئـاوی خـاوێن کـە دەسنوێژی پێ بگیردرێ.

**آب پـاکی:** ئـاو پـاکی؛ ئـاوی خـاوێنی؛ پاکـاوی؛ دوایـین ئاوێـک کـە بـۆ خـاوێن کردنەوە بە شتێکیدا دەکەن.

**آب پـشت:** *[کنـایی]* شـاوەت؛ ئـاو؛ ئـاوی پشت؛ ئـاوی؛ ئـاوێ کـە لـە ڕەحـەت بـوونی پیاودا دەڕژێ.

**آب تبلـور:** *[شـیمی]* ئـاوی بلـووری؛ ئـەو مۆلوکوولانـەی ئـاو ($H_2O$) کـە لـە دروسـت کـردنی سـاختمانی بلوورێکـدا بـەشـداری دەکەن.

**آب تـمـاج:** *[مجـازی]* ئـاوەلۆلـکە؛ تـەڕەتوولـکە؛ تـەڕەتوورکـە؛ ئـاوەلۆلـێ؛ خۆراکی بێ‌پیت و ئاوەکی.

**آب تنباکو:** ئاو تـەمـاکۆ؛ ئـاوی تـووتن؛ ئـاوێ کە تووتنی تێیدا خووسراوە.

**آب توبـە:** ئـاوی تۆبـە؛ ئـاوێ کـە دوای ئـەوە گونابار تۆبەی کـرد، بـەسـەریـدا دەکـەن کـە پێشووی لێ بسرێتەوە.

**آب جاری:** ئـاوی وەگـەڕ؛ ئـاو جـاری؛ ئـاوێ کە لە ئاوڕێژێکەوە دەڕوا: **آب روان**

**آب جـوش:** ئـاوەکـوڵ؛ ئـاوکوڵ؛ ئـاوەقولـێ؛ ئەوقوڵ؛ ئاوێ کە لە کوڵدایە.

**آب چـشم:** *[ادبـی]* فرمێـسک؛ فرمیـسک؛ ئەسـرین؛ هـەرسـی؛ ئـەسر؛ ڕۆنـدک؛ ئـاوی چـاو؛ ئـەشـک؛ هـەرش؛ هێـستر؛ هێـسیر؛ هەستار.

**آب چشمە:** کانیاو؛ ئـاوی‌کـانی؛ هانـەچـەمـە؛ ئاوێ کە لەکانی دێتەدەر.

**آب چلو:** ئـاو بـرنج؛ ئـاوێ کـە برنجـی تێـدا کوڵاوە و ئاوکێش‌کراوە.

**آب حیات:** ١. *[اساطیر]* ئـاوی حـەیـات؛ ئـاوی ژیـان؛ ئاڤـا ژیانـێ؛ ئـاوۆ ژیـوەی؛ ئـاوێ کـە هـەرکـەس بیخواتـەوە نـامرێ: **آب زنـدگی؛**

**آب حیوان؛ آب خضر** ٢. کارەبا؛ جۆرێ مووروگی زەردە کە ژنان بە دەس و پاوە هەڵیدەواسن ٣. *[مجازی]* خواردنەوەی ئەلکولی.

**آب حیوان** ☜ **آب حیات ـ١**

**آب خالص:** ئاوی بێ‌خەوش؛ ئاوی بێ‌ڕەنگ و بۆ و پاکژ.

**آب خام:** ئاوی سروشتی؛ ئاوێ کە هێشتا بۆ خاوێن بوونەوە، هیچ کاری لە سەر نەکرابێ.

**آب خضر** ☜ **آب حیات ـ ١**

**آب خوردن:** ئاوی خواردنەوە؛ ئاو خواردن؛ ئاڤا ڤەخارنێ؛ ئاووٚ/ ئاوەو واردەی؛ ئاوێ کە شیاوی خواردنەوە بێ.

**آب خورشت:** ئاوی خۆرشت؛ ئاو خوەرشت؛ ئاو چێشت؛ بەشی ئاوەکی خۆرشت بریتی لە ئاو، ڕۆن و... (وەکوو ئاوی تەماتە، ئاوقۆرە و...).

**آب خوش:** ئاوی خۆش؛ ئاوی گەوارا.

**آب دهان:** تف؛ تفگە؛ تفلیک؛ لیق؛ لیقاو؛ لیکاو؛ خوز؛ ئاو دەم؛ گڵوێز؛ گلیز؛ گرێز؛ لییەر؛ لیەراو؛ ڕینگە؛ لیکاوی زار؛ ئاووٚ دەمی؛ ئاڤا دەڤی.

**آب دیده:** *[ادبی]* فرمێسک؛ فرمیسک؛ هەرسی؛ ئەسر؛ ئەسرین؛ ڕۆندک؛ ئەشک؛ هێستر؛ هەستار؛ هێسیر؛ هەرش؛ ئاوی دیدە.

**آب راکد:** مەنداو؛ مەنداڤ؛ پەنگاو؛ پەنگاوە؛ یەق؛ ئاوی وەستاوی بێ‌بزووتن: **آب ایستاده؛ آب ساکن**

**آب روان** ☜ **آب جاری**

**آب زرشک:** ئاوی زریشک؛ ئاو زرشک؛ ئاوێ کە دانی زریشکیان تێدا خووساندووە.

**آب زندگی** ☜ **آب حیات ـ١**

**آب زیپو:** *[مجازی]* تەڕەتوورکاو؛ ئاوە لۆلێ؛ چێشتی ئاوەکی یان خواردنەوەی کاڵ و بێ‌تام (وەکوو ئاوگۆشتی بێ‌چەوری، یان چای کاڵ).

**آب زیرزمینی:** ئاوی ژێرزەوی. بەرانبەر: **آب سطحی**

**آب ژاول:** ئاو ژاوێل؛ ماکێکی تراو کە بۆ ڕەنگ لابردن و خاوێن‌کردنەوە بەکار دێت.

**آب ساکن** ☜ **آب راکد**

**آب سبز** ☜ **آب سیاه**

**آب سبک:** ئاوی سووک؛ ئاو سۆک؛ ئاوی سووکە؛ ئاوی خۆش؛ ئاوی گەوارا: **آب نرم**

**آب سبیل:** سمبل؛ خێراو؛ ئاوێ کە بە خێر بە تینوانی دەدەن.

**آب سخت** ☜ **آب سنگین**

**آب سطحی:** ئاوی ڕوو؛ ئاوێ کە بە ڕووی زەویدایە. بەرانبەر: **آب زیرزمینی**

**آب سفید** ☜ **آب‌مروارید**

**آب سنگین:** ئاوی قورس؛ ئاڤا گران: **آب سخت**

**آب سیاه:** ئاوی ڕەش؛ ئەوسێ؛ ئەوێ‌سێ؛ شیناوی چاو؛ نەخۆشی چاو، لەگەڵ ئێش و کەم‌سۆما بوونیدا، کە ئەگەر دەرمان نەکرێ ئەبێتە هۆی کوێری: **آب سبز**

**آب شور:** سوێراو؛ سۆلاو؛ شۆراو؛ لمک؛ خویواوک؛ فیراڤک؛ ئاوی شۆر؛ ئاوی سۆڵ؛ ئاوی سوێر؛ ئاوی سۆڵە؛ ئاوی زریاکان کە خوێی زۆری تێکەڵە و بۆ خواردنەوە و شۆردن و... نابێ. بەرانبەر: **آب شیرین**

**آب شیرین:** ئاوی شیرین؛ ئاوێ کە بۆ خواردنەوە و ئاودێران و شۆردن بە کار ئەبرێت. بەرانبەر: **آب شور**

**آب صابون:** ئاوی سابوون؛ ئاوساون؛ ئاراو؛

ئاوێ کە سابوونی تێکەڵاوە.
**آب صاف:** ژاوە؛ ئاوی ڕوون؛ ئاوی ڕۆشن.
**آب صنعتی:** ئاوی پیشەسازی؛ ئاوێ کە بۆ درووس‌کردنی دەسهاتی پیشەسازی بەکار ئەبرێ و ناخورێتەوە. هەروەها: **آب کشاورزی**
**آب طلا** ☜ **آب‌طلا**
**آب قلیل:** *[اسلام]* ئاوی قەلیل؛ ئاوێ کە لە ئاوی کور کەمترە.
**آب کدر:** لێڵاو؛ لەشێو؛ ژەڵم؛ شلوو؛ ئاڤشیز؛ بەخی؛ ئاوی شلوێ؛ ئاوی بە تویژ و لێڵ.
**آب کُر:** *[اسلام]* ئاوی کور؛ ئاوێ کە بارستاییەکەی لانی‌کەم یەک میتری چوارپاڵوو بێت.
**آب کمر:** *[کنایی]* شاوەت؛ تۆماو؛ ئاوی پشت؛ تراوێک کە لە ڕەحەت بوونی پیاودا، لێی دەرژێ.
**آب گرم** ☜ چشمەی آب‌گرم، **چشمه**
**آب گوشت** ☜ **آبگوشت**
**آب لاباراک:** ئاوی لاباراک؛ تراوێکی ڕەنگ لابەرە.
**آب لوله کشی:** ئاوی لوولەکێشی؛ ئاوێ کە بە لوولە لە سەرچاوەیەکەوە بۆ مالان ڕادەگوێزرێ ‹آب لوله‌کشی شهر: ئاوی لوولەکێشی باژێر›.
**آب مرد:** *[کنایی]* شاوەت؛ ئاوی پشت؛ تۆماو.
**آب مرده:** ئەو ئاوە کە مردووی پێ شۆردراوە.
**آب مروارید** ☜ **آب‌مروارید**
**آب مضاف:** *[اسلام]* ئاوی مەزاف؛ ئاوی گوڵ، میوە و شتی وا کە پاکە، بەڵام پاک ناکاتەوە.
**آب معدنی:** گازاو؛ گەڕاو؛ گڕاو؛ گڕ؛ ئاوی سەرچاوەی گەرم، کە تێکەڵاوی هەیە و زۆرتر گازیشی تێدایە.
**آب مقطر:** هەڵماو؛ ئاوێ کە لە سارد بوونەوەی هەڵمەوە بەرهەم دێ و هیچی تێکەڵ نیە.
**آب میوه** ☜ **آبمیوه**
**آب نرم** ☜ **آب سبک**
**آب نقره** ☜ **آبکاری**
**آبهای آزاد:** ئاوی ئازاد؛ ئەو بەشە لە ئاوی دەریا و ئوقیانووسگەل کە تایبەت بە وڵاتێک نیە.
**آبهای ساحلی:** کەرخاو؛ قەراخاو؛ ئەو بەشە لە دەریا و ئوقیانووس کە سەر بە وڵاتێکی دیاریکراوە.
**آب هویج:** ئاوگەزەر؛ ئاوگێزەر؛ ئاو هەویج.
**آب یخ:** سەهۆڵاو؛ یەخاو؛ یەخاوی؛ بەفراو؛ وەرواوە: ١. ئاوی زۆر سارد ٢. ئاوێ کە سەهۆڵیان تێ‌خستووە.
▣ **آب آوردن:** ئاو هێنان؛ ئاو تێ‌زان؛ ئاردەی؛ کۆ بوونەوەی ئاو لە لەشی مرۆڤ بەهۆی نەخۆشیەوە ‹آب آوردن شکم: ئاو هێنانی ورگ›.
**آب از آب تکان نخوردن:** *[مجازی]* هیچ نەقەومان؛ ئاوی جە ئاوی نەترازیەی ‹یک سال مدرسه را اداره کرد و آب از آب تکان نخورد: سالێک قوتابخانەکەی بەڕێوە برد و هیچ نەقەوما›: **آب از آب نجنبیدن**
**آب از آب نجنبیدن** ☜ **آب از آب تکان نخوردن**
**آب از چشمه گل آلود بودن:** *[کنایی]* ئاو لە چاوکەوە لێڵ بوون؛ لە چاوکەوە خراو ڕژان؛ کار لە بنەوە خراپ بوون.
**آب از دریا بخشیدن:** *[کنایی]* لە سەرکانی بەخشینەوە؛ لەسەر ئاو حمام تەعارف

کردن؛ شتی بێبایەخ بەخشین.

**آب از دست نچکیدن:** *[کنایی]* هیچ لێ هەڵنەوەرین؛ ئاو لە دەس نەتکان؛ دەس قووچاو بوون؛ وشکەهەورە بوون؛ زاد لە دەس دەرنەهاتن.

**آب از سر گذشتن:** *[کنایی]* کار لە کار ترازان؛ ئاو لە سەر دەرچوون؛ کار فەوتان ‹او دیگر گوشەی زندان است و اب از سرش گذشته: ئەو ئیتر لە گۆشەی گرتووخانەیە و کاری لەکار ترازاوە›.

**آب از لب و لوچه سرازیر شدن:** *[کنایی]* ئاو زانە دەم؛ دەم پڕ لە ئاو بوون؛ ئاو دەزار گەڕان؛ ئاوی پڕاینە دەم ‹تا این را گفتم آب از لب و لوچەاش سرازیر شد: هەرکە ئەوەم گوت ئاو زایە دەمی›.

**آب انداختن:** ١. *[مجازی]* میزکردن؛ گمێز کردن؛ ئاو ڕشتن؛ گمێز پژگنەی ‹حواست باشد، بچه اینجا آب انداخته: هۆشت بێ، منالەکە لێرەدا میزی کردووە› ٢. ئاو بەردان؛ ئاو تێخستن؛ ئاو هەڵکردن؛ ئاو نان؛ ئاو نیان؛ ئاوی هۆرکەردەی؛ ئاوی بریەیرە؛ ئاو لە جێگایەک بەردان ‹مزرعه را تازه آب انداخته بودند و زمین گل بود: تازە ئاویان بەردابووە ناو مەزراکە و زەوی قوڕ بوو› ٣. ئاو خستن؛ ئاو دانەوە؛ ئاوی ئاسەیەوە؛ ئاوکەوتنە سەر برێ خواردەمەنی (وەکوو ماست). هەروەها: **آب افتادن**

**آب بر آتش ریختن:** *[کنایی]* ئاو بە سەر ئاوردا کردن؛ تووڕەیی دامرکاندن.

**آب برداشتن:** *[مجازی]* ئاو هەڵگرتن؛ ئاو خواردنەوە؛ سەخت و دژوار بوون (سەبارەت بە قسەی کەسێ، کە وەرگرتن یان لێحاڵی بوونی دژوارە، یان مانای زۆری لێ ئەبێتەوە) ‹این حرف خیلی آب برمی‌دارد: ئەم قسە زۆر ئاو هەڵدەگری›.

**آب بردن:** ئاو بردن: ١. ئاو بەردەی؛ شتێ بە دەم ئاوەوە چوون ‹کاسە را لب رودخانه می‌شستم، آب برد: بایەکەم لە لێواری چەمەوە دەشۆرد، ئاو بردی› ٢. ئاو داماڵین؛ ئاو ماڵەی؛ کاول بوونی جێگەیەک بەهۆی ئاو تێبەربوونیەوە ‹خانه را آب برد: ماڵەکە ئاو بردی› ٣. *[مجازی]* ئاو خواردنەوە؛ پێویستی بە کار و خەرجی زۆر بوون ‹این کار خیلی آب می‌برد: ئەم کارە زۆر ئاو دەخواتەوە›.

**آب برکشیدن:** ئاو هەڵێنجان؛ ئاو هەڵهێنجان؛ ئاو هەڵکێشان؛ ئاوی هۆرگۆسەی؛ بە دەفر تراو هەڵکێشان.

**آب بستن:** ١. ئاو تێخستن؛ ئاو تێبەردان؛ ئاوی بینەی؛ بەر دانی ئاو بە جێگایەکدا ‹آب بستن به حوض: ئاو خستنە ناو هەسێڵ› ٢. ئاوکردنە سەر؛ ئاوی کەردەینە ‹قوری را آب بست و گذاشت روی سماور: ئاوی کردە سەر چادانەکە و نیایە سەر سەماوەرەوە› ٣. ئاو تێکردن؛ ئاو تێکەڵ کردن؛ ئاویەنە کەردەی؛ ئاوکردنە سەر تراوێک بۆ زۆر بوونەوەی ‹به هر کاسه شیر، یک پیاله آب می‌بست: هەر بایەیەک شیر، پیاڵەیەک ئاوی تێدەکرد› ٤. *[مجازی]* تەتەپەخێ کردن؛ دووترەمەگەزی کردن؛ بێ سەرنجدان بە دەستوور و قانوون، هەروا کارکردن ‹بی‌انصاف خیلی به کار آب بسته بود: بێئینساف لە کارەکەدا زۆری تەتەپەخێ کردبوو›.

**آب به آب شدن:** دوو هەواکەوتن؛ بەهۆی گۆڕانی جێگای ژیان، ناساغ و لەشبەبار بوون ‹چیزی نیست، آب به آب شده است، دو سه روز که بگذرد حالش خوب می‌شود: شتێ نیە، دوو هەوا کەوتووە، دوو سێ ڕۆژێکە، چاک دەبێتەوە›.

**آب به آسیاب کسی ریختن:** */کنایی/* ئاگری کەسێ گەشاندنەوە/ گەش کردنەوە؛ چۆ پێوەنان؛ کەسێ (زۆرتر لە کاری خراپدا) یارمەتی‌دان ‹آقایان هم با پخش شایعه‌های دروغ، آب به آسیاب دشمن می‌ریختند: سەرزلەکانیش بە بلاوکردنەوی هەوالی درۆ، ئاگری دوژمنیان ئەگەشاندەوە›.

**آب به دست شمر/ یزید افتادن:** */تعریض/* گورگ بوونە قازی؛ کالای پێداویست یان کاری خەلک کەوتنە دەسی کەسی گەند و بەرچاوتەنگ.

**آب به کرت آخر بودن:** */کنایی/* کرِی ئاخر بوون؛ ئاخری کار بوون ‹این مجله‌ای که می‌بینم آبش به کرت آخر است و همین روزها تعطیل می‌شود: ئەم گۆڤارە کە من دیومە کرێ ئاخریە و هەر لەم ڕۆژانە دادەخرێ›.

**آب به کرت اول بودن:** */کنایی/* لە جێی خۆ مانەوە؛ لە مالی هەوەلدا مانەوە ‹بعد از این همه دوندگی هنوز آب به کرت اول است و از محصول و درآمد خبری نیست: دوای ئەم هەموو تێکۆشانە هێما لە جێی خۆ ماوەتەوە و لە دەسهات و پارە خەبەر و باسێک نیە›.

**آب پاکی روی دست کسی ریختن:** */کنایی/* ئاو پاکی‌کردنە سەر دەستی کەسێکەوە؛ کەسێ تەواو ناهومێدکردن ‹آب پاکی ریخت روی دستم و گفت من اصلاً بدهکار تو نیستم: ئاوی پاکی کردە سەر دەستمەوە و وتی من قەرزدارت نیم›.

**آب پس دادن:** ئاو دان؛ ئاو دانەوە؛ نم دان؛ ئاوی دایوە؛ شۆ ئاسەیوە ‹شیر آب پس می‌دهد: شێرەکە ئاو ئەدات›.

**آب توی دل کسی تکان نخوردن:** */کنایی/* دلی کەسێک نەلەرزین؛ دڵ کەسێ دانەخورپان؛ کارەساتێ بۆ کەسێ پێش نەهاتن ‹نگذاشتم آب توی دل کسی تکان بخورد: نەمهێشت دلی کەسی بلەرزێ›.

**آب توی/ در گوش کسی کردن:** */کنایی/* کەسێ فریودان؛ کلاو سەر کەسێ نان؛ لە سەودادا کەسێ فریودان.

**آب توی/ در لانه‌ی مورچه ریختن:** */کنایی/* هورووژاندن؛ درووخاندن.

**آب جایی را خوردن:** */کنایی/* ئاوی جێگایەک خواردنەوە؛ لەوێ بوون؛ دەوێدا بوون ‹وقتی یک فصل آب شهر را خورد، دیگر ده را پسند نمی‌کند: ئەگەر وەرزێ ئاوی شار بخوانەوە، تازە لادێی پێ خۆش نابێ›.

**آب جایی را کشیدن:** ئاوی شوێنێ هەلگۆزین؛ ئاوی جێگایەک هەلکێشان؛ ئاوەو یاگێوە هۆرگۆستەی ‹آب چاه را کشید و ریخت توی حوض: ئاوی بیرەکەی هەلکیشا و ڕژاندیە نیو هەسێلەکەوە›.

**آب چیزی را گرفتن:** ئاوی شتێ گرتن؛ ئاوۆ چێوێوی هۆرچنیەی ‹آب پرتقال را بگیر: ئاوی پرتەقالەکە بکرە›.

**آب خنک خوردن:** ١. */کنایی/* شنەی دەشت و کوێستان هەلمژین؛ لە شوێنی خۆش ئاو و هەوادا ژیان؛ وارگەنە ژیوەی؛ بۆ حەسانەوە بەرەو زۆزان یان بژوێن چوون ٢. */کنایی/* کەوتنە گرتووخانەوە؛ زیندانی بوون.

**آب خوردن:** ١. ئاو خواردنەوە؛ ئاو خواردن؛ ئاو واردەیوە ‹دو لیوان آب خورد: دوو لیوان ئاوی خواردەوە› ٢. ☜ از جایی آب خوردن، جا[1] ٣. */مجازی/* خەرج هەلگرتن؛ مەزخ بەردەی ‹برایم صد تومان آب خورد: سەد تمەن خەرجی بۆم هەلگرت›.

**آب خوش از گلو پایین نرفتن:** */کنایی/* پایەک بە ڕەحەت دانەکێشان؛ نانێ بە ڕەحەت نەخواردن؛ هەناسێوی وەش

هۆرنــەکێــشتەی؛ هــەمیــشە لــە دەرد و خــەمــدا بــوون ‹یـک روز آب خـوش از گلـویم پـایین نرفـت: تاقـە ڕۆژێ پایـەکم بـە رەحـەت دانەکیسا›.

**آب دادن:** ئــاودان: ١. ئاویــاری‌کــردن؛ ئـاودێری‌کـردن؛ ئـاو دەردەی؛ ئـاو دارەی ٢. ئاوکاری‌کـردن؛ داپۆشـاندنی کـانزا بـە ئـاوی کانزایەکی‌تر بـۆ خـەملاندن یـان پاراستنی لە ژەنگ هێنـان ٣. ئـاو دانـەوە؛ کـانزای زۆر گــەرم بردنــە نــاو ئــاو یــا ڕۆن بــۆ پتــەو کردنەوەی. هەروەها: **آبداده**

**آب در غربال کردن:** *[مجازی]* ئـاو خـەسـت/ هەس‌کردنەوە؛ ئاوکوتانـەوە؛ بـا شـەن‌کـردن؛ ئـاو لـە دنگـا کوتـان؛ ئاوکردنـە سـەوەتـەوە؛ ئاوکردنــە بێژنگــا؛ ئــاوی ئــەنــەچنگــڵە کەردەی؛ کاری بێهـوودە و بـێ‌بایـەخ‌کـردن: **آب در هاون سـودن** *[ادبی]*؛ **آب سـفت کـردن** *[گفتاری]*

**آب در هــاون ســودن** ☜ **آب در غربــال کردن**

**آب دیـزی را زیـاد کـردن:** *[کنـایی]* ئـاوی چێـشتەکە زیـادکردن؛ ئـاو لـێ زیـادکردن؛ ئاوکردنـە سـەر چێـشتەکەوە؛ ئـاو تێکـردن؛ چێــشت (زیــاتر بــە لــێ زیــادکردنی ئــاو) زۆرکردنـەوە ‹نهـار را پـیش مـا بمانیـد، آب دیـزی را زیاد می‌کنیم: بـۆ فـراوین لـە لامـان بمێننـەوە، ئاوی چیشتەکە زیاد نەکەین›.

**آب را بــاز کــردن:** بــەردانی ئــاو؛ ئــاو بــازکردن؛ ئــاو هــەڵــکردن؛ ئــاو وەردەی. بەرانبــەر: **آب را بــستن** ‹آب را بـاز کـن، استخر پر شود: ئاوەکە بەردە، هەسێڵەکە پڕبێت›.

**آب را بستن:** ئاو بەسـتن؛ بـەسـتنی ئـاو؛ ئـاو داخـستن؛ ئـاو بینـەی. بـەرانبـەر: **آب را بـاز کردن** ‹ظرف پـر شـد، آب را ببنـد: دەفـرەکـە پـڕ بوو، ئاوەکە ببەستە›.

**آب را بــه هــم گــره زدن:** *[مجـازی]* پـۆس تــس‌گرتنــەوە؛ گــوو وشــکەوکــردن؛ دەسپاریزی‌کردنی لە ڕادەبەدەر.

**آب رفــتن:** ١. چوونــە ئــاو؛ لواینــە ئــاوی؛ کورت بوونەوەی قوماش یـا بـەرگ بـە هـۆی شــۆردنەوە. هــەروەهــا: **آب‌رفتــە** ٢. ئــاو چوونـەوە؛ ئـاو وشـک‌کـردن؛ ئـاو بڕیـەی؛ قـت‌بـوونی ئـاو ٣. *[مجـازی]* چوونـە ئـاو؛ کـز بــوون؛ تاویانـەوە؛ لواینـە وریـو؛ لاواز بــوون ‹بیچـاره خیلـی آب رفتـه: بێچـاره زۆر چـووەتـە ئاو›.

**آب رفته بـه جـوی بـاز نیامـدن:** *[کنـایی]* کـار لـە کـار تـرازان؛ ئـاوی ڕژاو کـۆ نـەبوونـەوە؛ ئــاوی چــووگ نــەگــەڕیانــەوە؛ پینــێ هۆرنـەگێرتـەی؛ تێکچـوون و هـەڵـشێوانی کــار بــە شــێوەیــەک ئیتــر وەک خــۆی لێ‌نەیێتەوە.

**آب زدن:** ١. تــەڕکــردن؛ نمــدارکردن. هــەروەهــا: **آبزده** ٢. پــشیلەشــۆرکردن؛ کتـک‌شـۆرکردن؛ سـەرسـەری و بـە پـەلـە شۆردن.

**آب زیر پوست کسی رفتن:** *[مجـازی]* ئـاو زانـە ژێر پێست کەسێکەوە: ١. بووژانـەوە؛ دیـسان لــە لــەش‌ســاغی و شــادابی تــا ڕادەیــەک بەهرەمەند بوونەوە ٢. گۆشت گرتن؛ وەخـۆدا هاتن؛ هێندێک قەڵەو بوون.

**آب سـرد روی سـر کـسی ریخـتن:** *[مجـازی]* کـەسـێ حـەپـەسـاندن؛ کـەسـێ تـەزانـدن؛ بەهـۆی کـارەسـات یـا هـەواڵـی ناخۆشـەوە، کــەســێ تووشــی ســەرســامی و ناهومێــدی کردن.

**آب سفت کردن** ☜ **آب در غربال کردن**

**آب شـدن:** ١. توانـەوە؛ تاویانــەوە؛ تاویــایوە؛ شــیایوە؛ قــەبوهــوژین؛ بهــیتن؛ بهــتین؛ حــەلــین؛ حــەلیــان؛ بوونـە ئـاو ٢. *[مجـازی]*

بێ‌ڕەنگ بوون؛ لەڕ و لاواز بوون؛ کز بوون؛ تاویایەوە ٣. *[مجازی]* شەرمەزار بوون؛ بوونە تکێ ئاو؛ تەریقەوە بوون ٤. *[مجازی]* گوم بوون؛ ون بوون؛ بزر بوون؛ نوقم بیەی؛ لە چاو گوم بوون.

**آب شدن و رفتن توی زمین:** *[مجازی]* بوونە مەل و باڵ‌گرتنەوە؛ ون بوون؛ بزر بوون؛ گوم بوون؛ نوقم بوون؛ نوقمەسار بوون ‹هر چە گشتم فایدەای نداشت، کلید آب شدە بود و رفتە بود توی زمین: هەرچی گەڕام قازانجی نەبوو، کلیلەکە ببووە مەل و باڵی گرتبووەوە›.

**آب کردن:** ١. تواندنەوە؛ تاواندنەوە؛ هەلینایش ‹طلاها را آب کردند و سکە زدند: زێڕەکانیان تواندەوە و سکەیان لێدا›. هەروەها: **آب‌کردە** ٢. *[مجازی]* تواندنەوە؛ تاواندنەوە؛ شتێکی بێ‌بایەخ فرۆشتن یا بە کەسێکی دیکە دان ٣. ئازاردان؛ چزاندن؛ پووش دانە دەست؛ گەهراندن.

**آب کسی با کسی بە/ در/ توی یک جو نرفتن:** *[مجازی]* دان پێکەوە نەکولان؛ خوێن لە تەشتێک تێکەڵ نەبوون؛ پێکەوە هەڵنەکردن؛ پێکەوە نەکریان؛ نەسازان ‹من و آرام آبمان بە یک جو نمی‌رود: من و ئارام دانمان پێکەوە ناکولێ›.

**آب کشیدن:** ١. ئاوکێشانە دەر؛ ئاو هەڵگۆزین؛ ئاو لێ‌کێشان؛ ئاو هۆرگۆستەی؛ دەرهێنانی ئاو لە جێگایەک ٢. ئاوکێشان؛ ئاوکێشتەی؛ بردنی ئاو لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی دیکە ٣. ئاو کێشان؛ پاکاوی ئاسەی؛ پاک‌کردنەوەی قوماش یا جل لە ناپاکی و ماکی خاوێنکەرەوە، بەهۆی خستنە ناو ئاوەوە ٤. کێم‌کردنی برین؛ ئاوکەردەی ٥. ئاوکێش بوون؛ ئاوواز بیەی؛ تینوویەتی هێنان؛ هۆی تینوویەتی بوون ‹ماهی شور، آب می‌کشد: ماسی سوێر، ئاوکێشە›.

**آب گرفتن:** ئاوگرتن: ١. ئاو داگرتن؛ ئاو پۆشنەی؛ ئاو جێگایەک گرتن و داپۆشاندنی ‹همە جا را آب گرفتە بود: هەموو جێگایەک ئاو گرتبووی› ٢. ئاو لێ‌گرتن؛ ئاو چنەگێرتەی؛ گرتنی ئاوی شتێک ‹این پرتقالها بە درد آب گرفتن می‌خورد: ئەم پرتەقاڵانە بە کاری ئاوگرتن دێن› ٣. لێگونجان؛ ئاو هەڵگرتن؛ جێگاکردنەوە؛ دێران؛ جێگەدار بوون؛ ئاو دارەی ‹این ظرف صد لیتر آب می‌گیرد: ئەم دەفرە سەد لیتر ئاو دەگری› ٤. ئاو هەڵخستن؛ ئاوگرتن؛ کۆکردنەوەی ئاو لەناو سەتڵ و دەبە و... لە بەر بێ‌ئاوی لە داهاتوودا.

**آب گرم کردن با کسی:** *[مجازی]* نان لەگەڵ کەسێک خواردن؛ تێکەڵ بوون/ دۆستی‌کردن لەگەڵ کەسێک ‹اگر با کسی آب گرم کردیم بە او نارو نمی‌زنیم: ئەگەر لەگەڵ کەسی نانمان خوارد فێڵی لێ ناکەین›.

**آب نخوردن چشم:** *[مجازی]* هیوا بە شتێک نەبوون؛ چاوەڕوان نەبوون؛ چەمەنە ئاوی نەواردەی ‹چشمم از این درس خواندن تو آب نمی‌خورد: هیوام بەم خوێندنەی تۆ نیە›.

**آب و گاو را یکی کردن:** *[مجازی]* کەم و زۆر تێکەڵ‌کردن؛ شەریک بوون؛ ئاوماڵ بوون؛ هاوبەش بوون.

**آبها از آسیاب افتادن:** *[کنایی]* ئاش لە هەراکەوتن؛ دامرکانەوە؛ قاڵ نیشتنەوە؛ هاژوکاژ نیشتەیوە؛ کۆتایی هاتنی ڕووداوێکی بەهەرا و هوریا.

**آبی گرم شدن:** *[کنایی]* تۆز لێ‌هەڵسان؛ ڕەنگدانەوە؛ خێردانەوە ‹از او آبی گرم

نمی‌شود: لەووە توزی هەڵناسێ›.
**از آب درآمدن:** لێ‌دەرهاتن؛ بەرهەم هاتن؛ لێ‌بوونەوە؛ بەر ئامەی؛ بە بار و دۆخ و چۆنیەتیەک دەرهاتن ‹بچەهایش خوب از آب درآمدند: منالەکانی چاکیان لێ‌دەرهات›.
**از آب کره گرفتن:** *[مجازی]* کەره لە ئاو گرتن؛ بە گونێو بەرانی پەنێره وەش کەردەی؛ لە کەلک هەڵکراندندا شارەزا بوون.
**از آب گرفتن:** لە ئاوگرتنەوە؛ جە ئاویەنە گێرتەیوە؛ بەدەس هێنان یا دەرهێنان لە ئاو (چەم، دەریا و...) ‹جنازەاش را از آب گرفتند: تەرمەکەیان لە ئاو گرتەوە›.
**از آب گل آلود ماهی گرفتن:** *[کنایی]* لە لێلاودا ماسی گرتن؛ لە تاریکی دەس بۆ بردن؛ هەل بە دەرفەت زانین؛ لە تێکەڵ- پێکەڵی کەڵک وەرگرتن.
**از آب و گل درآمدن** ☜ **آب و گل**
**با آب حمام دوست گرفتن:** *[کنایی]* سووک و هاسان دۆست گرتن؛ بە شتێکی چکۆلە دڵی کەسان بە دەست هێنان.
**به آب افتادن:** کەوتنە ناو ئاو؛ کەوتەیره ئاوی.
**به آب انداختن:** خستنە ئاو؛ خستنە ناو ئاو؛ نێو ئاو خستن؛ وسەینە ئاوی؛ لە ئاو (دەریا، چەم و...) خستن ‹کشتی به آب انداختن: گەمیە خستنە ئاو›.
**به آب دادن:** خستنە بەر ئاو؛ بە ئاودان؛ دانە دەم ئاوەوە؛ دەموو ئاویەره دەی.
**به آب زدن:** لە ئاو دان؛ خۆ خستنە ناو ئاو؛ دەی دڵێ ئاویەره ‹هوا گرم بود، به آب زدیم: هەوا گەرم بوو، دامان لە ئاو›.
**به آب و آتش زدن:** *[کنایی]* لە دار و بەرد دان؛ تێکۆشانی زۆر و مەترسی‌دار بە

مەبەستی بە ئامانج گەیشتن.
**آب‌آوردگی** / 'ābāvardegî/: *اسم. [پزشکی]* ڕەوتی ئاوهێنان؛ ئاو ئاردەی؛ نائاسایی هەڵتۆقانی لەش بە بۆنەی ئاو هێنانیەوە.
**آب‌آورده** / 'ābāvarde/: *صفت.* ١. لایەز؛ ئاوماڵک؛ گلار؛ شتێ کە لافاو لەگەڵ خۆی هێنابێتی ٢. *[مجازی]* مفت؛ خۆرایی.
**آب‌آهک** / 'āb(e)āhak/: *اسم.* قسلاو؛ دە ئاو کراوی ئاهەک؛ تێکەڵاوی ئاو و ئاهەک کە لە قوڕەکاریدا بە کار ئەبرێت.
**آبا** / 'ābā/: [عربی] *اسم. [ادبی]* باوکان؛ بابان؛ باوان؛ کالان؛ پیران؛ باپیران.
**آباجی** / 'ābācî/: [مغولی از ترکی] ☜ **آبجی**
**آباد** / 'ābād/: *صفت.* ئاوا؛ ئاڤا: ١. ئاوەدان؛ ئاڤەدان؛ قەوغا؛ ئاودار؛ جێگەی ئاو و گیا ‹زمین آباد: زەوینی ئاوا› ٢. ئاوەدان؛ ئاڤەدان؛ قەوغا؛ شیاو بۆ ژیان ‹شهر آباد: باژێری ئاوەدان› ٣. دڵگر و بەبرەو و خۆش؛ وەش‌دەماخ ‹باغ آباد: باخی ئاڤا› ٤. *[مجازی]* ئاوەدان؛ ئاڤەدان؛ بەهرەمەند؛ بەرەوەر؛ گەش؛ بەدەماخ ‹شب عیدی پدرزنم حسابی آبادمان کرد: شەوی جێژن، خەزوورم تەواو ئاوەدانی‌کردین› ٥. ئاوەدان‌کراو بە یارمەتی کەس یان شتێ (زۆرتر بۆ نێوی جێگایە) ‹حسن‌آباد: حەسەن‌ئاوا› ٦. شاد؛ خۆش؛ سەرکەیف.
⊡ **آباد شدن:** ئاوەدان بوونەوە؛ ئاوا بوونەوە؛ پاش وێران بوونی خانوو یا زەوی، دووبارە ساز بوونەوە. هەروەها: **آباد بودن**
**آبادکردن:** ئاواکردنەوە؛ ئاوەدان‌کردنەوە؛ پاش وێرانی، سازکردنەوە.
**آبادان** / 'ābādān/: *صفت.* ئاوەدان؛ ئاڤەدان؛ ئاوان؛ ئاوا؛ ئاڤا؛ بەهرەمەند لە ئاوەدانی ‹کشور آبادان شد: وڵات ئاوەدان بووەوە›. هەروەها: **آبادان بودن؛ آبادان شدن؛ آبادان کردن**

**آبـــادانی** / 'ābādānî/: /اسـم. ئـاوەدانی: ١. کـاری ئاواکردنــەوە ٢. بـار و دۆخ و چۆنیــەتی ئاوا بــوون ‹نـه آب بـود نـه آبادانی: نـه ئـاو بـوو نـه ئاوەدانی›.

**آبادسـازی** / 'ābādsāzî/: /اسـم. ئـاوەدان‌کـاری؛ کــار یــا ڕەوتی ئــاوەدان‌کردنــەوە ‹آبادسـازی روستاها: ئاوەدان‌کاری گوندەکان›.

**آبـــادگر** / 'ābādgar/: صـفت. ئاواکــــەرەوە؛ ئــاوەدان‌کـــار؛ ئــاوەدان‌کـــەرەوە؛ توانـــا لــە ئـاواکردنـەوەدا ‹او شخـصی کارآمـد و آبـادگر اسـت: ئەو کەسێکی کارامە و ئاواکەرەوەیە›.

**آبـادگری** / 'ābādgarî/: /اسـم. ئـاوەدان‌کـاری: ١. ئاواکـاری؛ کـار یـان ڕەوتی سـوور بـوون لـە سـەر ئـاوەدان‌کردنـەوە ٢. ئاواگـەری؛ کـار یـان ڕەوتی ئاواکردنـــەوە ‹آرام بیـــشتر عمـــرش را بـــه آبـادگری گذرانـد: ئـارام زۆربــەی تــەمــەنی بــە ئاوەدان‌کاری بەسەر برد›.

**آبـــادی** / 'ābādî/: /اسـم. ئـــاوایی: ١. /ـــهـــا/ ئاوایی؛گونـد؛ دێ؛ دەگـا؛ دێهـات؛ لادێ ‹اهـل آبـادی همـه کـوچ کردنـد: خـەڵـکی ئـاوایی هـەمـوو باریـان کـرد› ٢. ئـاوەدانی؛ ئـاوانی؛ ئابـادی ٣. کار یان ڕەوتی ئاوەدان‌کردنەوە.

**آبــارە** / 'ābāre، ـهـا/: /اسـم. جۆلـە؛ جۆگـەلـە؛ جۆگـا؛ جـۆ؛ ئـاوارە؛ جـۆی؛ جۆکـلێ؛ جۆبـار؛ جۆگەیەکـی دەسـکرد و سـەرواز بـۆ ڕاگـوێزانی ئاو.

**آبـاژور** / 'ābājûr، ـهـا/: [فرانـسوی]/اسـم. ئاباژۆر: ١. کلاوەیەکـی ڕەنگـی بـۆ ئـەهوەن‌کردنـەوەی تیشکی چرا ٢. چرایەکـی پایـەدار کـە ئـاوەهـا کلاوەیەکی لە سەر بێ.

**آباکـا** / 'ābākā/: [؟]/اسـم. ئاباکـا؛ هـەودا یـا ڕیشاڵێک کـە لـە ساقەتـەی مـۆزی فیلیپـینی ساز دەبێ.

**آب‌اکـــــسیژنه** / 'āb(e)oksîjene/: [فارســــی/ فرانـــسوی]/اســـم. ئاوئوکـــسیژینە؛ مـــاکێکی بێ‌ڕەنگ و ڕەنگ لابەرە: **آبِ اکسیژن**

**آب‌آلـو** / 'ābālû/: /اسـم. ئـاوی هــەڵــووژە؛ هــەرواوی؛ ئــاوی عــەلووکــە: ١. شـیلەی هــەڵــووچە ٢. مـەلیس؛ مـەلیساو؛ ئـاوێ کـە قەیسییان تێدا خووساندووە.

**آبـان** / 'ābān/: /اسـم. خـەزەڵـوەر؛ گـەلاڕێـزان؛ وەزتەکنـان؛ سـەرپـەڵـە؛ ئـاوان؛ وەران؛ مـانگی هەشتەمی ساڵی هەتاوی‌کە سی‌ڕۆژە.

**آب‌انبـــار** / 'ābambār, -anbār، ـهـا/: /اسـم. هەماراو؛ هەمبـاراو؛ جێگایـەکـی سـەرداپۆشـراو و زیـاتر لــە ژێـر زەویـەوە بـۆ پاشــەکـەوت خستنی ئاو.

**آب‌باریکـه** / 'āb.bārîke/: /اسـم. ١. جۆگـەلـە؛ جۆگـە؛ جۆلـە؛ جۆکـلێ؛ میـزاڤ؛ میـزاو ‹قنات آب‌باریکــه‌ای بــود کــه کفــاف اهــالی را نمــی داد: کارێزەکە جۆگـەلـەیـەک بـوو کـە بـەش خـەڵـکی نـەدەکـرد› ٢. /کنـایی/ بـژی و مـەمـر؛ نـەمـر و نەژی؛ مەمرە مەژی؛ کورتـە هۆرتـە؛ نـە قڕ نـە پڕ * **آبِ باریک**

**آب‌بـــاز** / 'āb.bāz، ـهـا؛ ـان/: /اسـم. [گفتـــاری] ئاوباز: ١. کـەسـێ کـە زۆر حـەزی لـە نـاو ئـاو بوونــە ٢. مــەلــەوان؛ زەریــەوان؛ ئــاڤژەن؛ بناولێدەر؛ نوقرڤان.

**آب‌بـر** / 'āb.bor، ـهـا/: /اسـم. ئاوبـڕکـە؛ ئاوبـڕ؛ بەشی بەرووی پایەی پرد، کـە تیـژە و ئـاوەکـە دەبڕێ: **آبشکن**

**آب‌برو** / 'āb.boro/ ☜ **شوربرو**

**آب‌بنـد** / 'āb.band، ـهـا/: /اسـم. بـەربـەنـد؛ بـەربـین: ١. دەریـژە یـان دیـوارێکی جووڵـەر بۆ بەرگـری لـە ڕۆیـشتنی ئـاو ٢. دیوارێـک بـۆ بەرگری لە وەگەڕانەوەی ئاو.

**آب‌بنـدی** / 'āb.bandî/: /اسـم. ئاوبـەنـدی: ١. کــار یــان ڕەوتی ئاوبــەنــدکردنی شــتێ یــان جێگــایــەک لـــە بـــەرانبـــەری نم دانـــەوەدا ‹آب‌بنـدی لولــه‌هــا را درسـت انجـام نـداده بـود:

ئاوبه‌ندی لووله‌کانی باش ئه‌نجام نه‌دابوو› ۲. ڕه‌وتێک که‌ ده‌بێته‌ هۆی کپ و کوێر بوونه‌وه‌ی درز و کونگه‌لی ده‌ستگایه‌کی نوێ. هه‌روه‌ها: **آب‌بندی شدن؛ آب‌بندی کردن**

**آب‌بها** / 'āb.bahā/: اسم. کرێ‌ئاو؛ ئاوبه‌ها؛ پاره‌یه‌ک که‌ ئه‌بێ به‌ مه‌زرینگه‌ی ئاو بدرێ.

**آبپاش** / 'ābpāš، ـها/: اسم. ئاوپژێن؛ ئاوپرژێن؛ ئاوپژگنه‌؛ ئاوپاش: ۱. ده‌فرێکی ده‌سکداری لووله‌درێژه‌ که‌ سه‌رێکی کون-کونی پێوه‌یه‌ و ئاوی پێ ده‌پرژێنن ۲. هه‌ر ئامرازێ بۆ پرژاندنی ئاو ‹ماشین آبپاش: ماشێنی ئاوپرژێن›.

**آبپاشی** / 'ābpāšî/: اسم. ئاوپاشی؛ گولنم؛ ئۆپشکن؛ ئاوره‌شه‌؛ ئاوپژێن؛ ئاورشێن؛ کار یان ڕه‌وتی پرژاندنی ئاو به‌سه‌ر شتێکدا، به‌تایبه‌ت زه‌وی و گوڵ و گیا. هه‌روه‌ها: **آبپاشی شدن؛ آبپاشی کردن**

**آب‌پخشان** / 'ābpaxšān، ـها/: اسم. ۱. قاچ؛ قاچاوکه‌؛ قوتکه‌ و زۆپگه‌لی نێوان دوو یان چه‌ند ڕووبار که‌ ده‌بنه‌ هۆی دابه‌ش بوونی ئاوی باران ۲. ئاوبه‌شێن؛ جێگای دابه‌ش کردنی ئاوی وه‌گه‌ڕ.

**آب‌پز** / 'ābpaz/: صفت. کولاو؛ کولیا؛ کولیاگ؛ گریا؛ ئه‌وکولوو؛ کولان له‌ نێو ئاودا به‌ بێ ڕۆن ‹سیب‌زمینی آب‌پز: سێفه‌زه‌مینی کولاو›.

**آبتاز** / 'ābtāz/: اسم. شه‌تاو؛ تیژه‌نگاو؛ نه‌وال؛ لافاوێک که‌ به‌ بۆنه‌ی ورد بوون و توانه‌وه‌ی سه‌هۆڵان له‌ به‌هار و هاویندا ڕێ ده‌که‌وێت.

**آب‌تراز** / 'ābtarāz/: صفت. ئاوتراز؛ به‌ ڕووبه‌ری ڕێک و ته‌ختانه‌وه‌ بۆ گه‌ڕانی ئاو ‹آب‌تراز کردن قنات: ئاوتراز کردنی کارێز›.

**آب‌تراش** / 'ābtarāš/: صفت. هه‌ڵکلۆشاو؛ هه‌ڵکلۆشراو؛ تاشراو بۆ ئه‌وه‌ی ئاوی تێدا خڕ بێته‌وه‌ ‹هندوانه‌ی آب‌تراش: شووتی هه‌ڵکلۆشاو›.

◘ **آب تراش کردن**: هه‌ڵکلۆشان؛ تاشینی گۆشتی میوه‌ی ئاودار بۆ ئه‌وه‌ی ئاو بگرێته‌ خۆی ‹هندوانه‌ را آب‌تراش می‌کند: شووتیه‌که‌ هه‌ڵده‌کلۆشی›.

**آب‌ترسی** / 'ābtarsî/: اسم. [روان‌شناسی] له‌ ئاو ترسان، که‌ به‌ هۆی نه‌خۆشینی هارییه‌وه‌ مرۆ تووشی دێت: **آبهراسی**

**آب‌تره** / 'ābtare، ـها؛ ـگان/: اسم. کووزه‌ڵه‌؛ کویزه‌ڵه‌؛ کویز؛ کووزی؛ بیزه‌روو؛ به‌رگه‌مێ؛ بریه‌مێ؛ تووز؛ کووز؛ سه‌وزی خۆراکی خۆرسک که‌ له‌ لای کانی و جۆگه‌ی ئاودا ده‌ردێ: **بولاغ‌اوتی**

**آبتل** / 'ābtal، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. ته‌پۆلکه‌ یان زۆپی نێوان ڕووبار یان ده‌ریا.

**آب‌تنباکو** / 'āb(e)tambākû, -tanbākû/ ☜ آب

**آبتنی** / 'ābtanî/: اسم. بالاق؛ مه‌له‌؛ مه‌لێ؛ له‌مێ؛ مالاو؛ شۆ؛ کار یان ڕه‌وتی مه‌له‌کردن له‌ هه‌سێڵ بۆ فێنک بوونه‌وه‌، خۆ شۆردن و...

**آبجو** / 'ābcow, 'āb(e)co:/: اسم. ئاوجۆ؛ ئابجوو؛ ئه‌وجوه‌؛ ئاوجه‌و؛ مزه‌ر؛ بیره‌؛ خواردنه‌وه‌یه‌که‌ له‌ جۆ دروست ده‌بێ.

**آبجوسازی** / 'ābcowsāzî, 'ābco:-/: اسم. ئاوجۆسازی؛ ئابجۆسازی: ۱. کار یان ڕه‌وتی درووس کردنی ئابجۆ. هه‌روه‌ها: **آبجوساز** ۲. /ـها/ کارخانه‌ یا کارگای درووس کردنی ئابجۆ.

**آبجی** / 'ābcî، ـها/: [مغولی/ ترکی] اسم. [گفتاری] خوشک؛ خۆشک؛ خۆیشک؛ خوج؛ خوه‌ه؛ خوار؛ والێ: **آباجی**

**آبچر**[1] / 'ābčar/: اسم. ۱. پووشانه‌؛ ئاڵفانه‌؛ پووش‌خۆرانه‌؛ مزی له‌وه‌ڕی ته‌رش له‌

زەوینی کەسێکی تردا ٢. لەوەڕگای ئاژەڵ کە هی خاوەن ئاژەڵ نەبێ.

**آبچر**[٢]: *صفت.* بەراوکەر؛ وەراوکەر؛ بەراڤکەر؛ خاوەن تایبەتمەندی لە نێو ئاودا چەرین.

**آبچــرا** / 'ābčarā/: *اسم.* ١. بـەردڵ؛ وەردڵ؛ بەرقلیانێکی کەم ٢. دان؛ دانە؛ خۆراکی مەل و مۆر.

**آبچشی** / 'ābčešî/: *اسم.* خۆراکێک (جگە لە شیر) کە بۆ یەکەم جار دەرخواردی کۆرپەی دەدەن.

**آبچکـان** / 'ābčekān، ـهـا/: *اسم.* ئاوچۆڕە؛ ئاوچنە: ١. باریکە شوێنێک کە بۆ پێدا چوونی ئاو لە دەسکردێک (وەک پاڵ دیوار یان یەخچاڵ) چێ دەکرێ ٢. چەشنێ جێدەفر بۆ ئاوەچۆڕکردنی کاسە و کەوچکی شۆردراو.

**آبچکــو** / 'ābčakû/: *صفت. [گفتاری]* لووشن؛ مووشن؛ ئاوەچۆڕە؛ لووت و چاو تەڕ و تەلیس.

**آبچکیــده** / 'ābčekîde/: *صفت.* خەستە؛ هەسە؛ هەسێنە؛ تاچن؛ خەستەوەبوو؛ ئاو لێچنراو (بەتایبەت بۆ خواردەمەنی، وەک ماست).

**آبچلیـک** / 'ābčelîk، ـها؛ ـان/: *اسم.* شێلاقە؛ شەلاقە؛ مەلێکی کۆچەرە سەرێکی خرت و دەندووکێکی درێژی هەیە.

**آبحــوض‌کـش** /'ābhowzkeš, 'āb(e)ho:z-/ ☜ **آبحوضی**

**آبحوضــی** / 'ābhowzî, 'āb(e)ho:zî، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم. [قدیمی]* ١. ئاوکێش؛ کەسێ کە پیشەی خاڵی‌کردنی ئاو هەمار و حەوز بووە ٢. بەردەست؛ کرێکارێ کە کاری هەمیشەیی نەبێ * **آبحوض‌کش**

**آبخاکی** / 'ābxākî/ ☜ **آبی‌خاکی**

**آبخــشک‌کــن** / 'ābxoš(k)kon، ـها/: *اسم.*

زوهانگ؛ زوانگ؛ مژەر؛ مەرەکەفمژ؛ پەڕەیەکی زوور و پرزدار کە مەرەکەفی نووسراوەی پێ وشک دەکەنەوە.

**آبخــوان** / 'ābxān، ـها/: *اسم.* ناقاو؛ زەلەمە؛ چین یا زناوگەی ژێر زەوینی کە لە ئاوەکەی کەڵک وەربگیردرێ.

**آبخوانـــــداری** / 'ābxāndārî/: *اسم.* ئاوژێرخان؛ زانستی دۆزینەوەی کەڵک وەرگری و چاوەدێری لە ئاوی ژێر زەوی.

**آبخــور** / 'ābxor، ـها/: *اسم.* ١. ئاوگیر؛ ئاڤڤەخور؛ ئەو بەشە لە ئامرازێ کە ئەکەوێتە نێو ئاوەوە ‹آبخور کشتی: ئاوگیری گەمیە›: **آبگیـر- ٥** ٢. بەراو؛ بنەجۆ؛ دەراڤ؛ جێگەی دابین بوونی ئاوی ئاوەدێری ٣. بەرسمێڵ؛ وەرسمێڵ؛ بەشی خوارووی سمێڵ کە دێتە سەر لێو ٤. ئاوچن؛ ڕادەی ئاوکێشانی زەوی کشت‌وکاڵ.

**آبخــوری** / 'ābxorî، ـها/: *اسم. [قدیمی]* ١. ئاوخۆرە؛ ئاوخۆری؛ لیوان؛ قومقومۆک؛ پەرداخ؛ شەربە؛ زەرک؛ تماق؛ تەرار؛ بەرزەق؛ دەماخ؛ گوسک؛ هەرچی ئاوی پێ دەخورێتەوە ٢. لەغاو؛ جۆرێ دەمبێنی ئەسپ کە ئاڵقەی خوار لەوسی نیە و کاتی ئاودانی بۆی دەبەسرێ.

▣ **آبخوری سفالی:** گوژنەو؛ گۆژنە؛ گۆژنەوە؛ گلێنەی ئاو خواردنەوە؛ شەربەی لە سواڵەت.

**آبخیــز** / 'ābxîz، ـها/: *اسم.* ئاورێژ؛ ئاورێژگە؛ شوێنێک کە هەموو ئاوە وەگەڕەکانی ئەرژێتە چۆمێک یان زەلیایەکەوە: **آبریز-١**

**آبخیــزداری** / 'ābxîzdārî/: *اسم.* ئاورێژوانی؛ زانستی بەهرەگری لە زەوینگەلی بەستێنی ئاورێژگە، پێشگری لە پووکانەوەی خاک، بەر پێ گرتنی سێلاوان و باشترکردنی

گیاجاڕی.

**آبداده** / ābdāde'/ ☜ آب دادن، **آب**

**آبدار** / ābdār'/ ☜ **آبدارچی**

**آبدار** / ābdār'/: *صفت.* ئاودار: ۱. ئاو تێزاو؛ بۆڵ؛ تێرئاڤ؛ بئاڤ؛ پڕئاو؛ پەڕئاو؛ ئەودار؛ خاوەن ئاوی زۆر ‹میوەی آبدار: میوەی ئاودار› ۲. *[مجازی]* تەڕ؛ بەهێز و کارا ‹بوسەی آبدار؛ سیلی آبدار: ماچی تەڕ؛ زللەی ئاودار› ۳. کارگێڕی ئاودارخانە.

⊡ **آبدار شدن:** ئاو تێزان؛ ئاوگرتن؛ ئاو گرتنەخۆ.

**آبدارباشی** / ābdārbāšî'/: [فارسی/ ترکی] ☜ **آبدارچی**

**آبدارچی** / ābdārčî'، ها/: [فارسی/ ترکی] /اسم. ئابدار؛ ئابدارباشی؛ ئاودارچی؛ کارگێڕی چاپەز و قاوەچی دیوەخان: **آبدارباشی**

**آبدارخانه** / ābdārxāne'، ها/: /اسم. ئابدارخانە؛ ئاودارخانە؛ کونەلان؛ ژووری قاوەلێنان و چا سازکردن.

**آبدارک** / ābdārak'، ها؛ ان/: /اسم. فیسقە؛ قوونگەهەڵتەکێنە؛ کلکەهەڵتەکێنە؛ بەرگاییلکە؛ ئنەوەسۆنگلێ: **دم‌جنبانک**

**آبداری** / ābdārî'/: /اسم. ئاوداری؛ بۆڵی؛ تێراوی؛ پڕئاوی؛ بار و دۆخ و چۆنیەتی ئاودار بوون ‹پرتقال به این آبداری کمتر دیده‌ام: پرتەقاڵی بەم ئاوداریەم کەم دیوە›.

**آبدان** / ābdān'، ها/: /اسم. گمێزدان؛ میزەڵدان؛ میزڵدان؛ مسوڵدان؛ موسڵدان؛ میزدان: **مثانه**

**آبدانک** / ābdānak'، ها/: /اسم. گمێزدان؛ میزەڵدان؛ میزڵدان؛ مسوڵدان؛ پوڤدانک؛ میزدانک: **مثانه**

**آبدرمانی** / ābdarmānî'/: /اسم. ئاودەرمانی: ۱. ڕەوشتێ بۆ دەرمانی تاقمێ نەخۆشی بە وەرزشی تایبەت لە ئەستێر یان سەرچاوەی ئاوی کانزایی و هەروەها خواردنەوەی ئاوی کانی ۲. ڕەوشتێ بۆ تەندروستی بە شێوەی ئاو زۆر خواردنەوە.

**آبدره** / ābdarre'، ها/: /اسم. لەپاو؛ شیپاو؛ چوونە پێشەوەی باریکەئاوی دەریا لە وشکانیدا.

**آبدزد** / ābdozd'، ها/: /اسم. قوڵە؛ وڵەمووش؛ ئاودزە؛ کونێ لە زەوی کە ئاو لەوێوە دەچێتە ناخی زەمینەوە.

**آبدزدک** / ābdozdak'، ها/: /اسم. ۱. تورومپا؛ ئامرازی چکۆلەی لاستیکی یان پلاستیکی بۆ بە تەوژمەوە پژاندنی ئاو ۲. /ان/ جۆبڕ؛ جۆبڕە؛ جۆبڕکە؛ جێبڕک؛ جۆبڕک؛ قوزگەزک؛ لار؛ هووڵە؛ مڵە؛ مڵ؛ قاژنگە؛ سنک؛ جانەوەرێکە لە ژێر زەوی دەژی و ڕەگی گیا دەخوا: **انگشت‌بُر**

**آبدمزن** / ābdamzan'/ ☜ پرستوی دریایی، **پرستو**

**آبدنگ** / ābdang'، ها/: /اسم. ئاوپەڕە؛ پەڕەیەک کە بە هێزی ئاو کار دەکات.

**آبدوست** / ābdûst'/: *صفت. [شیمی]* هیدرۆفیل؛ خاوەن تایبەتمەندی تێکەڵخوازی لەگەڵ ئاودا.

**آبدوغ** / ābdûq'/: /اسم. دۆغورمە؛ ئاودۆ؛ ئەوێدۆ؛ تریتەدۆ؛ ئاڤاماست؛ خواردەمەنیەکی ئێرانی بە شێوەی ماستاو (کە زۆرتر خەیار، سەوزی، مێوژ و گوێزی تێدەکەن).

**آبده** / ābdeh'/: /اسم. بناو؛ ئاودەرە؛ کونجۆکارێزی.

**آبدهی** / ābdehî'/: /اسم. ئاودەری؛ ئاودەیی؛ توانایی سەرچاوەیەک (وەک کارێز، ڕووبار، بیر...) بۆ ئاودان لە هەر چرکەیەکدا: **دبی**

**آبدیدگی** / ābdîdegî'/: /اسم. بارهاتوویی؛ لەکەڵدەرهاتوویی؛ بار و دۆخ و چۆنیەتی

بارهاتن ‹کار سخت و زندگی در کوه، موجب آبدیدگی می‌شود: کاری دژوار و ژیان لە کێودا، ئەبێتە هۆی لەکڵ‌دەرهاتوویی›.

**آبدیده** / ābdîde'/: *صفت.* ١. نمرچ؛ گزنگاز بوو بە هۆی ئاوەوە؛ شتێ کە ئاو خراپی کردبێ ٢. *[فلزکاری]* ئاودراو؛ ئاودریاگ؛ لەبەر ئاو دانراو ‹فولاد آبدیده: پۆلای ئاودراو› ٣. *[کنایی]* لەکڵ‌دەرهاتوو؛ بارهاتوو؛ تاڵ و سوێری ڕۆژگار چەشتوو؛ سەرد و گەرمی ڕۆژگار چەشتگ. هەروەها: **آبدیده بودن؛ آبدیده شدن؛ آبدیده کردن؛ آبدیده گشتن**

**آبراهه** / ābrāhe'، ـها/: *اسم.* زائاو؛ ئاوزێ؛ ئاوەڕێژ؛ ڕەهەند؛ گونج؛ گونجە؛ ئاوەڕۆ؛ ڕێ‌ئاو؛ ئەوڕی؛ ئاوبەر؛ ئاوبگار؛ بواری (زۆرتر دەسکرد) بۆ ئاو.

**آبرسانی** / ābresānî'، ـها/: *اسم.* کار یان ڕەوتی ئاوکێشان؛ کێشانی ئاو لە بناوانەوە بۆ بنکەکانی‌تری ئاو (بە لوولەکێشی، کاناڵ‌کێشی یان بە هەر جۆرێکی‌تر).

**آبرست** / ābrost'، ـها/: *صفت.* *[گیاەشناسی]* ئاوڕس؛ ئاوڕسک؛ ئاوڕواو؛ ئاوی؛ بە تایبەتمەندی یان توانستی ڕوان لە ئاودا.

**آبرفت** / ābroft'، ـها/: *اسم.* ١. تەرازنە؛ هەریزنە؛ ئاوماڵشت؛ چەوماڵ؛ چینگەلی جێماو لە گەڕانی ئاو و نیشتنی قوڕ و زیخدا ٢. لیتە؛ لم؛ خەرگ؛ هەرگ؛ هەڕە؛ قوڕاوێک کە لافاو لەگەڵ خۆی دەیبا و لە شوێنە چاڵ و نەویەکاندا بە جێی دێڵێ.

**آبرفتی** / ābroftî'/: *صفت.* ئاوماڵشتی؛ چەوماڵی.

**آبرنگ** / ābrang'/: *اسم.* ئاوڕەنگ: ١. /ـها/ ماکێکی ڕەنگیە بۆ نیگارکێشی ٢. تابلۆیەک کە بە ئاوڕەنگ کێشرابێ.

**آبرو** / ābrow'، ـها/: *اسم.* کوتە؛ نسوێن؛ ئاوڕێژ؛ ڕەهەند؛ گونج؛ گونجە؛ ئاوەڕۆ؛ بواری ڕۆیشتنی ئاو.

**آبرو** / āb(e)rû'/: *اسم.* ئاوڕوو؛ ئابڕوو؛ ئابوور: ١. ئاکاری هاوڕێ لەگەڵ بایەخگەلی کۆمەڵایەتی کە دەبێتە هۆی سەربەرزی و خۆشناوی ٢. دۆخ یان چۆنیەتیەک کە دەبێتە هۆی سەربڵندی و ناوی چاکە.

⊡ **آبرو برای کسی نگذاشتن:** ئابڕوو بۆکەسێ نەهێشتنەوە؛ ئابڕووی کەسێ تکاندن؛ ئاوڕوو پەی یۆی ناسەیوە ‹با حرفهایی کە زد ابرو برایش نگذاشت: بەو قسانە کە کردی ئابڕووی بو نەهێشتەوە›.

**آبروی کسی را بردن/ ریختن:** ئاوڕووی کەسێ بردن؛ ئاوڕووی کەسێ تکاندن؛ ناو کەسێ زڕاندن؛ شەقڵ شکاندن؛ سووکایەتی بەسەرهێنان؛ ئاوڕوو یۆی بەردەی ‹با این رفتارها ابروی ما را بردی: بەم ئاکارانە ئاورووومانت برد›.

**آبروی کسی را خریدن:** ئابڕووی کەسێ سەندنەوە؛ بەرگری‌کردن لە بەدنامی و ناو زڕانی کەسێ ‹آن روز ابروی ما را خریدی: ئەو ڕۆژە ئابڕوومانت سەندەوە›.

**آبروی کسی رفتن:** ئاوڕووی کەسێ چوون؛ ئاوڕووی کەسێ نەمان؛ سووک بوون لە بەر چاوان؛ ناوی کەسێ زڕان؛ ئاوڕووی کەسێ تکان؛ ئاوڕوو یۆی شیەی؛ شەرمەزار یا ڕووسیا بوونی کەسێ ‹پیش مردم ابرویم رفت: لای خەڵکی ئاورووم چوو›.

**آبروت** / ābrût'/: *اسم.* سووتاوی؛ سووزیاگی؛ سووتاوە؛ پۆرگ؛ بلۆق؛ بلۆقە؛ سووتان بەهۆی ئاو یان تراوێکی داخەوە.

⊡ **آبروت کردن:** قوشقن‌کردن؛ ئاوڕووت کردن؛ ئاوەڕووت‌کردن؛ مریشکی سەربڕاو خستنە ناو ئاوەکوڵ بۆ ڕووتاندنەوەی پەڕەکانی.

**آبرودار** / āb(e)rûdār'/: *صفت.* *[گفتاری]*

ئاوڕوودار؛ بەئابڕوو؛ بەحەیا ‹آزاد، مرد آبرودار است: ئازاد پیاوێکی ئاوڕوودارە›.

**آبروداری** / 'āb(e)rûdārî/: اسم. ئاوڕووداری؛ بە ئاوڕوو ژیان؛ ژیانی بە چاکە و سەربەرزی.

**آبرورفته** / 'āb(e)rûrafte/: صفت. ئابڕووڕژاو؛ ئاوڕووتکاو؛ ناوزڕاو؛ ئابڕوونەماو؛ سووک و بێئابڕوو؛ ئەوڕی تەکیایە.

**آبروریزی** / 'āb(e)rûrîzî/: اسم. ئابڕوو چوون؛ ئاوڕوو شیەی؛ بار و دۆخ، کار یان ئاکارێک کە ببێتە هۆی بەدناوی ‹میهمانیشان آبروریزی بود: میوانیەکەیان ئابڕووچوون بوو›.

■ **آبروریزی کردن**: بێئابڕوویی بارهێنان؛ ئابڕوو بردن؛ ڕووڕەشی بارهێنان؛ ڕوەسیاوی وەش کەردەی ‹چرا برای صد تومان اینهمه آبروریزی می‌کنی؟: بۆچی بۆ سەد تمەن ئەم هەمووە بێئابڕوویی باردێنی؟›.

**آبروغن** / 'ābrowqan, -ro:qan/: اسم. ئاوڕۆن؛ ڕوەناوە؛ ئاوەکوڵ و ڕۆنی تێکەڵاو کە بەسەر چێشتیدا دەکەن.

**آبرومند** / 'āb(e)rûmand/: صفت. ئابڕوومەند: ١. ڕووسوور؛ ڕووپاک؛ سەربەرز؛ بەحەیا؛ خاوەن بڕ و ڕێزی کۆمەڵایەتی ‹او از خانوادەی آبرومندی است: ئەو لە بنەماڵەیەکی ئابڕوومەندە› ٢. سازیار لەگەڵ بایەخگەل و داب و نەریتی کۆمەڵگادا ‹عروسی آبرومند: زەماوەندی ئابڕوومەند›.

**آبرومندانه** / 'āb(e)rûmandāne/: قید. ئابڕوومەندانە؛ ئاوڕوومەندانە؛ بە شێوازی ئابڕوومەند ‹مهمانی، آبرومندانه برگزار شد: میوانیەکە ئابڕوومەندانە بەڕێوە چوو›.

**آبرومندی** / 'āb(e)rûmandî/: اسم. ئابڕوومەندی؛ ئاوڕوومەندی؛ ڕووسووری؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی ئابڕوودار بوون ‹بابا جان! آبرومندی کە بە خانە و ماشین و پول نیست: کاکە گیان! ئابڕوومەندی خۆ بە ماڵ و ماشین و پارە نیە›.

**آبرون** / 'ābrûn/: اسم. وەرکەمەر؛ گەڵاماسی؛ گیایەکی بۆنخۆشە، بەهاران لە سەر بەردان دەڕوێ.

**آبریز** / 'ābrîz، ـها/: اسم. ١. ☜ **آبخیز** ٢. مەنهۆڵ؛ مەنگۆڵ؛ مەنگۆڵە ٣. پلووسک؛ پلوور؛ پلوورە ٤. گونج.

**آبریزش** / 'ābrîzeš/: اسم. لووشە؛ چڵمەشۆڕە؛ ڕژانی نائاسایی ئاو لە چاو و لووتەوە: **آبریزە**

**آبریزگاه** / 'ābrîzgāh، ـها/: اسم. کناراو؛ ئاودەس؛ دەس‌ئاو؛ دەساو؛ مەستەراو؛ مستەراو.

**آبریزه** / 'ābrîze/ ☜ **آبریزش**

**آبزدایی** / 'ābzedāyî، ـها/: اسم. [شیمی] ئاوچنی؛ ئاوەچنکاری؛ کار یان ڕەوتی گرتنی ئاو لە شتێ.

**آبزرشک** / 'āb(e)zerešk,-zerešg/ ☜ آب

**آبزن** / 'ābzan، ـها/: اسم. جەکووزی؛ جۆرێ وانی حەمامە کە لە هەموو لایەکیەوە ئاوی بە تەوژم دێتە دەرەوە و لەش دەشێلێ.

**آبزی** / 'ābzî، ـها: ـان/: صفت. ئاوژی؛ ئاوی؛ ئاقی؛ تایبەتمەندی گیانلەبەرێک کە لە ئاودا دەژی.

**آبزیپو** / 'āb(e)zîpo/ ☜ آب

**آبزیخانه** / 'ābzîxāne، ـها/: اسم. ئاکواریۆم؛ وەنەدی ماسیان.

**آبزیدان** / 'ābzîdān، ـها/: اسم. ئاکواریۆم؛ وەنەدی ماسیان.

**آبزیرکاه** / 'ābzîr(e)kāh، ـها/: صفت. [کنایی] ئاوژێرکا: ١. مارمزووک؛ مارمەزووک؛ نهێنکار ٢. نەرمەبڕ؛ لە بنەوە بڕ؛ نەرمکێ بن کایێ؛ چێرەنەبڕ.

**آبساب** / ābsāb'، ھـا/:اسم. سەنگساو؛ ئامرازی تایبەتی بۆ ساوین و ھەسان‌دانی موزاییک. ھەروەھا: **آبساب کردن**

**آبسال** / ābsāl'/:اسم. تەڕسال؛ تەڕسال؛ بارانەسال؛ پەڕئاوە؛ سالی پڕ باران. بەرانبەر: **خُشکسال**

**آبست** / ābsat'، ھـا/:اسم. [نامتداول] چارەوەز؛ تۆکل؛ توێکلە؛ پێست یان پەڕەی ناوەکی برێ میوە (وەکوو پێستە ناسکەی گوێز، پستە، فنۆق یان دانەوێلە).

**آبستره** / ābst(e)re'/: [فرانسوی] صفت. ھاوێری؛ ئاوارتە؛ دوور لە پێوەندی لەگەل دەور و بەریدا.

**آبستن** / ābestan'/: صفت. ١. ئاوس؛ ئاڤس؛ یاوس؛ ھاوس؛ واڤز؛ لەمەپەڕە؛ ئاوز؛ زک‌پڕ؛ دووجان؛ دووگیان؛ نۆسکە؛ ئێملە؛ سکدار؛ زگدار؛ باردار؛ تۆل لە زگدا ‹همسرش آبستن است: ژنەکەی ئاوسە› ٢. [مجازی] لەبەر؛ پێبووگ؛ بارھەلگر؛ ئامادە بۆ ڕووداو یان کارەساتێ ‹جھان آبستن جنگ بود: جیھان شەڕی لەبەر بوو›.

◘ **آبستن شدن**: ئاوس بوون؛ ئاڤیسن؛ زک‌پڕ بوون؛ لەمەپەڕ بیەی.

**آبستن کردن**: [مجازی] خۆشەکردن؛ سەندن؛ ئەسەی؛ بەپارە کەسێ کڕین؛ بەرتیل دان و ھاوکاری کەسێ بەدەس‌ھێنان ‹دزدان از مدتی پیش نگھبان را آبستن کرده بودند: دزەکان پێشووتر نگابانەکەیان خۆشە کردبوو›.

**آبستنی** / ābestanî'/: صفت. ئاوسی؛ ئاڤسی؛ ئاڤزی؛ سک‌پڕی؛ زک‌پڕی؛ لەمەپەڕی؛ بارداری؛ دۆخی گۆھانداری مێوینەی پێگەیشتوو لە سەردەمێ کە تۆلی لە پزداندایە ‹مدت آبستنی در انسان ٩ ماه است: ماوەی ئاوسی لە مرۆڤدا ٩ مانگە›.

◘ **آبستنی کاذب/ دروغین**: شەیتان‌ئاوسی.

**آبسته** / ābaste'/ ☜ زمین آبسته، **زمین**

**آبسرا** / ābsarā'، ھـا/:اسم. [قدیمی] ئاوەلیان؛ خانووی سەر ئاو کە دە کەونارادا بە سەر گۆل و گۆماوان و لەبان کۆلەکەگەلێکەوە دەکرایەوە.

**آبسردکن** / ābsardkon'، ھـا/:اسم. ئاو ساردکەرەوە؛ ئاوفێنکەوکەر؛ کەرەسەیەک کارەبایی، ئاوی تێسدەکەن، ساردی دەکاتەوە.

**آبسنج** / ābsanc'، ھـا/:اسم. ئاوپێو؛ ئامرازێ بۆ پێوانی قورسی و سووکی تراوان.

**آبسنگ** / ābsang'، ھـا/:اسم. گاشەی ژێر ئاو کە کاتی کشانەوەی ئاو، دەردەکەوێ.

**آبسه** / ābse'، ھـا/: [فرانسوی]اسم. [پزشکی] ١. کوان؛ کۆڤان؛ قونیر؛ گۆنر؛کونێر؛ وەرمەک؛ بەرکی؛ دومەل؛ دمەل؛ ئاوپەڕ؛ ئارینج؛ مەوێژە؛ ھانەکوان؛ زیپکەی گەورەی پڕ لە کیم و زووخ ٢. ئاوەزا؛ ئاودز؛ ئاوجز؛ تیراوێ؛ گرووز؛ زامی ئاو تێزاو و کیم ھاوردوو.

**آبشار** / ābšār'، ھـا/:اسم. ١. /ـان/ تاڤگە؛ تافگە؛ تافە؛ تافینە؛ تاف؛ ھاوشار؛ ئاوشۆڕ؛ ئاوھەلدێر؛ سەرووەشین؛ بافل؛ قەلبەزە؛ تاوتاف؛ سولاڤ؛ سویلاڤ؛ سیتاف؛ سیتاڤک؛ ڕیژاڤ؛ ڕێژاو؛ سواڤ؛ لووس؛ لووساو؛ لووساوک؛ سورک؛ سوپێل؛ سول ٢. [ورزش] سپەک؛ کوتاندنی توپ بە توندی لە زەمینی ئەوبەردا (والیبال، تێنیس، پینگ‌پۆنگ و...).

**آبشامه** / ābšāme'/:اسم. [کالبدشناسی] نێوانپۆش؛ پەردەیەک لە نێو لەشدا کە برێ لە هلۆلیەکانی ناوزک دادەپۆشێ.

**آبشخور** / ābešxor'، ھـا/:اسم. ئاوخۆرگە؛ دەراڤ؛ دەراو؛ مەخەلگا؛ نا؛ جێگایەک لە

چۆم، جۆگە یان کانی کە ڕێ هەیە ئاوی تێدا بخورێتەوە.

**آبشر** / ābšor'، ـهـا/: /اسم. /گفتاری/ چۆڕاو؛ شۆڕاو؛ ئاوهەڵدێر؛ شۆش؛ تافی چکۆلەی دەسکرد.

**آبشش** / ābšoš'، ـهـا/: /اسم. سی؛ سیئاو؛ ئاوشۆشی؛ سیهـ ؛ ئەندامی هەناسەدانی گیانلەبەری ئاوژی.

**آبششدار** / ābšošdār'، ـان/: /صفت. ئاوشۆشدار؛ سیئاودار؛ تایبەتمەندی گیانداری خاوەن سیهـ .

**آبششی** / ābšošî'/: صفت. سیئاوی؛ بەسراو یان پێوەندیدار بە سیئاوەوە.

**آبشکن** / ābšekan'/ ☜ **آببُر**

**آبشن** / ābšan'/ ☜ **آویشن**

**آبشناس** / ābšenās'، ـها: ـان/: /اسم. ئاوناس؛ ئاڤناس؛ کەسێ کە زانست و توانایی لە بواری ئاوناسیەوەیە.

**آبشناسی** / ābšenāsî'/: /اسم. ئاوناسی؛ ئاڤناسی؛ زانستی ناسینەوەی ئاو، بەتایبەت لە باری پێوەندی لەگەڵ ژیاندا.

**آبشویی** / ābšûyî'، ـهـا/: /اسم. ڕێخەوشۆر؛ نیسکەوشۆر؛ بەرەشۆ؛ بەردەشۆر؛ کاری شۆردنەوە بە ئاو بۆ لێک جیاکردنەوەی سووک و قورس لە یەکتر (وەک جیا کردنەوەی وردە ڕیخ لە دانەوێڵە): **خاکشویی**

**آبشیب** / ābšîb'، ـهـا/: /اسم. ۱. خوڕگە؛ بوارگەی ڕژدی ئاو؛ جۆگەی ئاو بە شیوی زۆرەوە ۲. تاف؛ ئاوی خوڕ ۳. قەڵوەز؛ قەڵوەزە؛ قەڵبەزە؛ ئاوهەڵدێر.

**آبشیرین‌کن** / ābšîrînkon'، ـهـا/: /اسم. ئاو شیرینکەرەوە؛ ئاو شیرینکەر؛ ئامراز یان دامەزراوەی تایبەت بە پالاوتن و شیرینکردنی ئاوی سوێر.

**آبطلا** / ābtalā'/: [فارسی/ عربی] /اسم.

ئاوتەلا؛ زێڕئاو؛ تەلای تراو کە بۆ ئاوکاری بەکار دەڕوا.

**آبغوره** / āb(e)qûre'/: /اسم. ئاوقۆرە؛ ئاڤشیلە؛ قۆڕە؛ سیهک؛ گوشراوی بەرسیلە.

◘ **آبغوره گرفتن**: /تعریض/ فیشکەفیشک کردن؛ فینگەفینگ کردن؛ گریان؛ گیریان؛ گرەوەی.

**آبفشان** / ābfešān'، ـهـا/: /اسم. ئاوپژێن: ۱. ئامرازێ کە ئاو دەپژێنێ و لە ئاوەدێری باخچەدا بەکار دێ ۲. سەرچاوەی ئاوی گەرم کە شوێن لە دووی شوێن، هەڵم و ئاوی گەرمی لێ هەڵدەقوڵێ.

**آبقمبل** / ābqombol'/ ☜ **آبکوپیل**

**آبقند** / āb(e)qand'/: [فارسی/ معرب] /اسم. ۱. ئاوقەن؛ شەربەت قەن ۲. قەنداخ؛ ئاوگەرم و قەن.

**آبکار** / ābkār'، ـها: ـان/: /اسم. ئاوکار؛ کەسێ کە پیشەی ئاوکاریە.

**آبکاری** / ābkārî'/: /اسم. ئاوکاری: ۱. کار یان ڕەوتی داپۆشاندنی کانزا بە ئاوی کانزایەکی دیکە (وەک زێڕ، زیو و...) بۆ خەملاندن یان بەرگری لە ژەنگهێنان. هەروەها: **آبکاری کردن** ۲. /ـهـا/ کارگای ئەو کارە.

**آبکردنی** / ābkardanî'/: صفت. ۱. بۆ تاواندنەوە؛ تواندنەوەیی؛ قاڵکردنی؛ لە باو بۆ کردنە ئاو ‹این کَره آب‌کردنی است، آبش کن بریز روی پلو: ئەم کەرەیە بۆ تاواندنەوە باشە، بیتوێنەوە و بیکە سەر پلاوەکەدا› ۲. /ـهـا/ /کنایی/ فرۆشتنی؛ شیاوی فرۆشتن ‹آب‌کردنی‌ها را آب کن، بقیه را هم بریز دور تا انبار خالی شود: ئەوی فرۆشتنیە، بیفرۆشە، پاشماوەکەشی فڕێدە با هەمارەکە چۆڵ بێ›.

**آبکره** / ābkore'/: [فارسی/ عربی] /اسم.

هیدروسفیر؛ کۆمەڵەی ئاوەگەلی زەوین.

**آبکش** / ābkeš'، ـهـا/: *اسم.* ۱. سوزمە؛ سووزمە؛ تەینجە؛ تەوجە؛ ئاشپاڵوو؛ پاڵێو؛ ئاوپاڵ؛ پالانەک؛ ئاشپاڵوو؛ سەلە؛ نانەشان؛ نانەشانە؛ ئاڤکێش؛ تەیکە؛ تەک؛ سافۆ؛ چوختەکە؛ دەفرێ کە بۆ پالاوتنی برینج و ساوار و... کون‌کون کراوە ۲. آوند آبکش ☜ **آوند** ۳. *[نامتداول]* ئاوکێش؛ ئاوبەر؛ ئاوگێڕ؛ کەسێ کە ئاوی دەبردە دەرکی مالان و ئاوانی وەردەگرت ٤. ئاوکێش؛ ئاوخواز؛ ئاوواز؛ چێشتی سۆڵ یان زۆر چەور.

▣ **آبکش کردن:** ۱. پالاوتن؛ ئاسەیرە؛ بە سوزمە ئاوی شتێ گرتن ۲. *[کنایی]* کون‌کون‌کردن؛ وڵ‌وڵ کەردەی؛ وەک سوزمە ئاژن ـ ئاژن کردن.

**آبکشت** / ābkešt'، ـهـا/: *اسم.* ئاوچاندن؛ ئاوچێن: ۱. کار یان ڕەوتی چاندن و ڕواندنی گیا، بە بێ خاک و تەنیا بە کەلک وەرگرتن لە کوودی تراو ۲. ئەو گیایە وا بەم شێوەیە چێندراوە.

**آبکشی** / ābkešî'، ـهـا/: *اسم.* ئاوکێشی؛ کار یان ڕەوتی ئاوکێشان.

**آب‌کشیده** / ābkešîde'/: *صفت.* تەڕ و تلیسک؛ تەڕ و تلیز؛ تەڕ و تلیس؛ خووساو؛ خووسیاگ؛ فیسیا؛ فیسیاگ؛ دە ئاو گەوزاو ‹موش آب‌کشیده: مشکی تەڕ و تلیسک›.

**آبکک** / ābkak'، ـهـا/: *اسم.* ئاوڕۆشەنەوکەرە؛ گیانلەبەرێکی وردیلەی ئاوژی بێ سی و جەرگە کە لە ڕێگای پێستیەوە هەناسە دەدات و مەلاوانێکی باشە.

**آبکند** / ābkand'، ـهـا/: *اسم.* ئاودڕ؛ لاندڕ؛ بوودڕ؛ ڕەهۆڵ؛ زندور؛ کەولۆس؛ کەنداڵ؛ ئاودڕکە؛ ئاودڕگە؛ جۆم؛ دڕناڵ؛ کەن؛ کەند؛ کەنداو؛ کەناو؛ خڕ؛ جێ‌لافاو؛ ئەو جێگەیە ئاو دایدڕیوە.

**آبکوپیل** / ābkûpîl'/: *اسم. [زیست‌شناسی]* تیرەیەک لە پەلەوەرانی ئاوژی، بە دندووکی هەڵگەڕاوە، باڵی پان و سەری پۆپنەوە: **آبقُمبُل**

**آبکوهه** / ābkûhe'، ـهـا/: *اسم.* شاپێل؛ گاپێل؛ گەقل؛ لیپ؛ ئاڤزین؛ نێرینەی ئاو؛ شەپۆلی زۆر بەرزی ئاو.

**آبکی** / ābakî'/: *صفت. [گفتاری]* ئاوەکی: ۱. تەڕ؛ تەوش؛ برنگاو؛ تراو؛ ئاوین؛ دولە؛ دژی خەست ‹غذای آبکی بخور: چێشتی تەڕ بخۆ› ۲. شل؛ تراو؛ تەڕ ‹مربایش کمی آبکی بود: مرەباکەی تۆزێ شل بوو› ۳. بێ‌تام؛ نەگرساو؛ تەوش؛ بێ‌کاریگەری یان هێزی پێویست ‹شوخی آبکی: گاڵتەی بی‌تام›.

**آبکیس** / ābkîs'/: *اسم.* پیرۆک؛ پیرەڵۆک؛ پنر؛ ترکیێ؛ چرچ و لۆچێک وا بەهۆی زۆر مانەوە لە ئاودا لە پێستی سەرقامکدا بەدی‌دێت.

**آبگاه** / ābgāh'/: *اسم. [گفتاری]* ۱. پووتەگا؛ خالیگە؛ کەلەکە؛ لابرگ؛ کیلەکە؛ برک؛ کێلەکێ؛ کالەکا؛ تەنشت؛ تەڕیژە؛ بنپاڵ؛ پەراسوو؛ گورچوو؛ گرچک؛ ئەوگە؛ غالیکە ۲. میزەڵدان؛ میزڵدان؛ گمێزدان؛ مسولدان؛ جێگەی میز لە ناو زگدا.

**آبگذر** / ābgozar'، ـهـا/: *اسم.* جۆگە؛ جۆلە؛ ویەراو؛ ئاوەڕێژ؛ ڕەهەند؛ جۆبار؛ ئاوەڕۆ؛ دەربازگەی دەسکرد بۆ گواستنەوەی ئاو (وەک کاریز).

**آبگرا** / ābgarā'/: *صفت.* ئاوخواز؛ ئاوواز؛ ئاوەگر؛ بە تایبەتمەندی ئاوخوازیەوە.

**آب‌گرایی** / ābgerāyî'/: *اسم.* ئاوخوازی؛ ئاوەگری؛ تایبەتمەندیەک لە گیاگەلدا کە ئەبێتە هۆی جووڵانەوە و گەش و هەراش بوونیان لە ڕاستەی ڕەوتی ئاودا.

هیدروسفیر؛ کۆمەڵەی ئاوەگەلی زەوین.

**آبکش** / ābkeš'، ـهـا/: اسم. ١. سوزمە؛ سووزمە؛ تەینجە؛ تەوجە؛ ئاشپاڵوو؛ پاڵێو؛ ئاوپاڵ؛ پالانەک؛ ئاشپاڵوو؛ سەلە؛ نانەشان؛ نانەشانە؛ ئاڤکێش؛ تەیکە؛ تەک؛ سافۆ؛ چوختەکە؛ دەفرێ کە بۆ پالاوتنی برینج و ساوار و... کون‌ـکون کراوە ٢. آوند آبکش ☜ **آوند** ٣. *[نامتداول]* ئاوکێش؛ ئاوبەر؛ ئاوگێڕ؛ کەسێ‌کە ئاوی دەبردە دەرکی مالان و ئاوانی وەردەگرت ٤. ئاوکێش؛ ئاوخواز؛ ئاوواز؛ چێشتی سۆڵ یان زۆر چەور.

▣ **آبکش کردن**: ١. پالاوتن؛ ئاسەیرە؛ بە سوزمە ئاوی شتێ گرتن ٢. *[کنایی]* کون‌ـکون‌کردن؛ وڵ‌ـوڵ‌کەردەی؛ وەک سوزمە ئاژن ـ ئاژن کردن.

**آبکشت** / ābkešt'، ـهـا/: اسم. ئاوچاند؛ ئاوچێن: ١. کار یان ڕەوتی چاندن و ڕواندنی گیا، بە بێ خاک و تەنیا بە کەڵک وەرگرتن لە کوودی تراو ٢. ئەو گیایە وا بەم شێوەیە چێندراوە.

**آبکشی** / ābkešî'، ـهـا/: اسم. ئاوکێشی؛ کار یان ڕەوتی ئاوکێشان.

**آب‌کشیده** / ābkešîde'/: صفت. تەڕ و تلیسک؛ تەڕ و تلیز؛ تەڕ و تلیس؛ خووساو؛ خووسیاگ؛ فیسیا؛ فیسیاگ؛ دە ئاو گەوزاو ‹موش آب‌کشیده: مشکی تەر و تلیسک›.

**آبکک** / ābkak'، ـهـا/: اسم. ئاوڕۆشەنەوکەرە؛ گیانلەبەرێکی وردیلەی ئاوزی بێ سی و جەرگە کە لە ڕێگای پێستیەوە هەناسە دەدات و مەلاوانێکی باشە.

**آبکند** / ābkand'، ـهـا/: اسم. ئاودڕ؛ لاندڕ؛ بوودڕ؛ ڕەهۆڵ؛ زندور؛ کەولۆس؛ کەندال؛ ئاودڕکە؛ ئاودڕگە؛ جۆم؛ دڕنال؛ کەن؛ کەند؛ کەنداو؛ کەناو؛ خڕ؛ جێ‌لافاو؛ ئەو جێگەیە ئاو دایدڕیوە.

**آبکوپیل** / ābkûpîl'/: اسم. *[زیست‌شناسی]* تیرەیەک لە پەلەوەرانی ئاوزی، بە دندووکی هەڵگەڕاوە، باڵی پان و سەری پۆپنەوە: **آبقُمبُل**

**آبکوهه** / ābkûhe'، ـهـا/: اسم. شاپێل؛ گاپێل؛ گەڤل؛ لیپ؛ ئاڤزین؛ نێرینەی ئاو؛ شەپۆلی زۆر بەرزی ئاو.

**آبکی** / ābakî'/: صفت. *[گفتاری]* ئاوەکی: ١. تەڕ؛ تەوش؛ برنگاو؛ تراو؛ ئاوین؛ دولە؛ دژی خەست ‹غذای آبکی بخور: چێشتی تەڕ بخۆ› ٢. شل؛ تراو؛ تەڕ ‹مربایش کمی آبکی بود: مرەباکەی تۆزێ شل بوو› ٣. بێ‌تام؛ نەگرساو؛ تەوش؛ بێ‌کاریگەری یان هێزی پێویست ‹شوخی آبکی: گاڵتەی بێ‌تام›.

**آبکیس** / ābkîs'/: اسم. پیرۆک؛ پیرەڵۆک؛ پنر؛ ترکیێ؛ چرچ و لۆچێک وا بەهۆی زۆر مانەوە لە ئاودا لە پێستی سەرقامکدا بەدی‌دێت.

**آبگاه** / ābgāh'/: اسم. *[گفتاری]* ١. پووتەگا؛ خالیگە؛ کەلەکە؛ لابرگ؛ کیلەکە؛ برک؛ کێلەکێ؛ کالەکا؛ تەنشت؛ تەڕیژە؛ بنپال؛ پەراسوو؛ گورچوو؛ گرچک؛ ئەوگە؛ غالیکە ٢. میزەڵدان؛ میزڵدان؛ گمێزدان؛ مسوڵدان؛ جێگەی میز لە ناو زگدا.

**آبگذر** / ābgozar'، ـهـا/: اسم. جۆگە؛ جۆلە؛ ویەراو؛ ئاوەڕێژ؛ ڕەهەند؛ جۆبار؛ ئاوەڕۆ؛ دەربازگەی دەسکرد بۆ گواستنەوەی ئاو (وەک کارێز).

**آبگرا** / ābgarā'/: صفت. ئاوخواز؛ ئاوواز؛ ئاوەگر؛ بە تایبەتمەندی ئاوخوازیەوە.

**آب‌گرایی** / ābgerāyî'/: اسم. ئاوخوازی؛ ئاوەگری؛ تایبەتمەندیەک لە گیاگەلدا کە ئەبێتە هۆی جوولانەوە و گەش و هەراش بوونیان لە ڕاستەی ڕەوتی ئاودا.

**آدمچه** / ādamče'، ـها/: [معرب/ فارسی]/اسم. ☜ **آدمک**

**آدمخوار** / ādamxār'، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] صفت. ۱. مرۆخۆر؛ مرۆدڕ؛ خاوەن خوو یان هۆگری خواردنی گۆشتی مرۆڤ ‹گرگ آدمخوار: گورگی مروخور› ۲. [کنایی] خوێنمژ؛ خوێنخۆر؛ زۆر زاڵم و ستەمگەر ‹فاشیستهای آدمخوار: فاشیستگەلی خوینمژ›.

**آدمخواری** / ādamxārî'/: [معرب/ فارسی] /اسم. مرۆخۆری؛ مرۆدڕی: ۱. بە خوو یان هۆگری خواردنی گۆشتی مرۆڤ ‹ادمخواری در میان برخی قومهای ابتدایی رواج داشت: مروخوری لە نێو تاقمێ لە خێڵگەلی سەرەتاییدا باو بوو› ۲. کار یان خووی خواردنی گۆشتی مرۆڤ ‹در هنگام قحطی، آدمخواری چندان عجیب نبود: لەکاتی قات و قڕیدا، مرۆخوری زۆر سەیر نەبوو›.

**آدمربا** / ādamrobā'، ـها؛ ـیان/: [معرب/ فارسی]/اسم. مرۆدز؛ مرۆڕفێن؛ کەسێ کە مرۆڤ دەدزێ ‹آدمربا از زن شخص ربوده شده یک میلیون باج خواسته است: مرودزەکە لە ژنی پیاوە دزراوەکە ملیۆنێ پیتاکی داوا کردووە›.

**آدمربایی** / ādamrobāyî'، ـها/: [معرب/ فارسی]/اسم. مرۆدزی؛ مرۆڕفێنی؛ کاری دزینی مرۆڤ ‹این آدمربایی انگیزەی سیاسی داشته است: ئەم مرودزیە هۆی ڕامیاری بووە›.

**آدمرو** / ādamrow'، ـها/: [معرب/ فارسی] /اسم. ماڵووکە؛ وەتاغە چکۆلەی جێ تاکەکەسێک لە بن زەویەوە، بۆ تۆڕی لوولەکێشی و ڕەهەند و...

**آدمزیوی** / ādamzîvî'/: [؟]/اسم. ناوی خولی چوارەمی زەویناسی کە بە دەرکەوتنی مرۆڤگەلی سەرەتاییەوە (باب و کاڵی مرۆی ئێستایی) دەناسرێ: **آنتروپوزوئیک**

**آدمشناس** / ādamšenās'، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] صفت. مرۆناس؛ مرۆڤناس؛ ئادەمناس؛ خاوەن توانایی ناسین و هەڵسەنگاندنی لێهاتوویی، کار یان خوو و خدەی کەسانی دیکە. هەروەها: **آدمشناسی**

**آدمفروش** / ādamfurûš'، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] صفت. مرۆفرۆش؛ ئادەمفرۆش؛ خاوەن خدە یا هۆگر بە مرۆفرۆشی.

**آدمفروشی** / ādamfurûšî'، ـها/: [معرب/ فارسی]/اسم. مرۆفرۆشی؛ ئادەمفرۆشی؛ کار و ڕەهاتی سپاردن یان دیلکردنی مرۆڤ بە دەس کەسانی دیکە بۆ بەدەسهێنانی قازانج (وەکوو فرۆشتنی کچ و ژنی لاو بە کابارە).

**آدمقحطی** / ādamqahtî'/: [معرب/ فارسی] اسم. [کنایی] پیاوقاتی؛ قاتەپیاو؛ کەم بوونی ئینسانگەلی لێهاتوو ‹مگر آدمقحطی بود کە او را مسؤول کردند: مەگەر پیاوقاتی بوو کە ئەویان کردە بەرپرس›.

**آدمک** / ādamak'، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] /اسم. ۱. خوێڕی؛ خوێڕیلە؛ بێکارە؛ ناکەس ‹این آدمکهایی کە دنبال این و آن راه می‌افتند: ئەم خویریانە کە ئەکەونە دوای ئەم و ئەوەوە›: **آدمچه** ۲. پەیکەری وەکوو مرۆ، لیستۆک یا پەیکەرێک کە لە تاقمێ وەرزشدا بۆ فێرکاری بە کار دەڕوا.

**آدمکش** / ādamkoš'، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] صفت. مرۆکوژ؛ پیاوکوژ؛ پیاوگوژ؛ میرکوژ؛ کوژەری کەسێ یان چەندکەس ‹چند آدمکش را فرستادند تا آنها را بکشند: چەن مرۆکوژیان نارد تا ئەوان بکوژن›.

**آدمکشی** / ādamkošî'، ـها/: [معرب/ فارسی] /اسم. مرۆکوژی؛ میرکوژی؛ پیاوکوژی؛ کێستەنە ‹مجازات آدمکشی مرگ است: سزای

میرکوژی مەرگە〉.

**آدم‌ماشینی** / ādam.māšînî'، ـها/: [معرب/ فرانسوی]/اسم. مرۆڤیٚ ئالاڤکی؛ ڕوبوت؛ مرۆی دەسکرد.

**آدم‌مصنوعی** / ādam.masnû'î'، ـها/: [معرب/ عربی]/اسم. مرۆڤیٚ ئالاڤکی؛ ڕوبوت؛ مرۆی دەسکرد.

**آدم‌ندیده** / ādamnadîde'، ـها/: [معرب/ فارسی] صفت. [مجازی] کێفی؛ کێوی؛ کێفیلە؛ دەشتەکی؛ نامۆ لەگەڵ شارستانیەت و داب و دەستووری کۆمەڵگا.

**آدم‌نما** / ādamnemā'، ـها؛ ـیان/: [معرب/ فارسی] صفت. مرۆئاسا؛ مرۆکار؛ پەیوەندیدار یا سەر بە مرۆئاساگەلەوە.

**آدمی** / ādamî'، ـان/: [معرب از عبری]/اسم. [ادبی] مرۆڤ؛ مرۆ؛ بنیادەم؛ مەرڤ؛ مەری؛ مهۆ؛ بەشەر.

**آدمیّت** / ādamîyyat'، ـها/: [معرب/ عربی] اسم. ۱. مرۆیەتی؛ مرۆڤیەتی؛ بنیادەمی؛ بار و دۆخ یا چۆنیەتی ئادەم بوون 〈مرتبەی آدمیت: پلەوپایەی مرویەتی〉 ۲. پیاوەتی؛ مرۆڤایەتی؛ کار و ئاکاری مرۆڤانە 〈آدمی را آدمیت لازم است: مرۆ پێویستە مرۆڤایەتی بیٚ〉.

**آدمیرال** / ādmîrāl'، ـها/: [انگلیسی از عربی] اسم. [نظامی] ئادمیراڵ؛ زەریامیر؛ دەریاسالار؛ جنراڵی هێزی دەریایی.

**آدمی‌زاد** / ādamîzad'، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی]/اسم. مرۆ؛ مرۆڤزا؛ ئینسان؛ ئادەمیزا؛ ئادەمی 〈از آدمی‌زاد هر چه بگویی برمی‌آید: لە مرۆوە هەرکاریٚ بلێی دەشیٚ〉.

**آدمی‌زاده** / ādamîzāde'، ـگان/: [معرب/ فارسی]/اسم. [ادبی] ئادەمیزاد؛ مرۆڤزا.

**آدمی‌سیرت** / ādamîsîrat'، ـان/: [معرب/ فارسی] صفت. [ادبی] مرۆڤکار؛ مرۆکار؛ خاوەن ئاکار و کردەوەی باش و مرۆڤانە.

**آدینه** / ādîne'، ـها/: اسم. [ادبی] هەینی؛ هەنی؛ هەینوو؛ هەینە؛ ئەینی؛ ئین؛ جومعە؛ جمعە.

**آذار** / āzār'/: [سریانی]/اسم. ئادار: ۱. ئازار؛ مانگی سێهەمی سالی هەتاوی برێک لە ولاتە عەرەبیەکان کە لە ۱۰ی ڕەشەمەوە تا ۱۰ی خاکەلێوەیە ۲. مانگی شەشەمی سالی عورفی و مانگی دوازدەهەمی سالی دینی یەهوود ❊ آزار

**آذاراقی** / āzārāqî'، ـها/: [معرب از ؟]/اسم. ژارماسی؛ ژەحرەماسی؛ مەرگەماسی؛ سەکوژ؛ پیقل: ۱. دارێکی چکۆلەی پرگەڵای بن ئەستوورە کە میوەیەکی گۆشتداری هەیە ۲. میوەی ئەو دارە کە بە ئەندازەی سێوێکە، زۆر تاڵە و ژەهری ئیسترکنینی تێدایە و بۆ دەرمانی بە کار دێنن ❊ **کُچوله؛ آزارقی**

**آذر** / āzar'/:اسم. ۱. [ادبی] ئاگر؛ ئاور؛ ئایەر؛ ئار؛ ئایر؛ ئێگر؛ ئەیر ۲. سەرماوەز؛ سیخوار؛ ئازەر؛ ساران؛ هۆسار؛ خۆسار؛ گاقۆڕ؛ گاڤۆر؛ نۆهەمین مانگی سالی ئێرانی کە ۳۰ ڕۆژە.

**آذربو** / āzarbû'/: [؟] ☜ **بِرِنجاسَف**

**آذرخش** / āzaraxš'، ـها/:اسم. [ادبی] چەخماخە؛ وریٚ؛ بەرق؛ تریشقە؛ ترشقە؛ برووسکە؛ برویسیٚ؛ برویسی؛ برووسکە؛ تەشبریق؛ هەورە تریشقە؛ چەخماخەیەکی برووسکەداری زۆر مەزن کە بە هۆی خالی بوونەوەی کوتوپڕی باری کارەبایی هەوران لە هەوادا ڕوو دەدا و بەرق وگرمەیەکی بەقەوەت بەدیدێنیٚ.

**آذرگون** / āzargûn'، ـها/:اسم. ۱. گوڵی ئاورین؛ گوڵی ئاگرین؛ گوڵەئەرخەوانی ۲. گوڵی لالەعەباسی؛ خەوەردۆس ۳. هەمیشەبەهارە؛ گوڵی هەمیشە بەهار؛

بەیبوونە کێویلە؛ گوڵەبەیبوونی کێوی.

**آذری**[1] / āzarî/: اسم. ئازەری: ١. ـها؛ ـان/ کەسێ کە خەڵکی ئازەربایجانە ٢. لە زمانە ئێرانیەکان کە خەڵکی ئازەربایجان زووتر (تا چەرخی شەش و حەوتی کۆچی) قسەیان پێدەکرد ٣. لە زمانگەلی تورکی لای ڕۆژهەلات کە ئێستاش قسەی پێ دەکرێ: **ترکی آذری**

**آذری**[2]: صفت. ئازەری؛ پەیوندیدار یان هاوگەر بە ئازەربایجانەوە ‹ترکی آذری: تورکی ئازەری›.

**آذرین** / āzarîn/ ☜ سنگ آذرین، **سنگ**

**آذریون** / āzaryûn/ ☜ **همیشەبهار**

**آذوغه** / āzûqe/: [ترکی] ☜ **آذوقه**

**آذوقه** / āzûqe/، ـها؛ ـجات/: [ترکی]/اسم. ١. تۆشە؛ زەواد ‹آذوقەی راه: تۆشەی ڕێگا› ٢. ئازووقە؛ ئازۆخە؛ ئازووخە؛ تفاق؛ بژیوی پێداویست لە ماڵدا ‹آذوقەی زمستان: تفاقی زستان› * **آذوغه؛ آزوقه؛ آزوغه**

**آذین** / āzîn/: اسم. [ادبی] ١. ـها/ تیوتیوە؛ تیفتیفە؛ ڕازێنە؛ ئازن؛ ئەو شتەی بۆ خەملاندنی جێگایەک، بەتایبەت بۆ ڕێ و ڕەسمێکی دیاریکراو بە کار دەڕوا ٢. ڕازان؛ کار یان ڕەوتی ڕازانەوە؛ ڕازاندن؛ خەملاندنی جێگایەک.

◘ **آذین بستن/ بخشیدن**: ڕازاندن؛ خەملاندن؛ ئازن بینەی؛ ڕازاندنەوەی جێگا یان شتێ بە بەستنەوەی هەڵپەرتاوتەگەلێک (وەکوو چرا، گوڵ و...). هەروەها: **آذین‌کردن**

**آذین‌بندی** / āzînbandî/، ـها/: اسم. کار و ڕەوتی ڕازاندنەوە؛ ڕازاندنەوەی جێگایەک بە گوڵ، چرا، ئاڵا و لەم چەشنەیە بە بۆنەی جێژن و شاییەوە.

**آر**[1] / ār/: [فرانسوی]/اسم. ئار؛ پێوانەیەک بۆ پێوانی زەوی بەرامبەر بە ١٠٠ میتری چوارگۆشە.

**ـ ار**[2]: پسوند. ـ ار: ١. نیشانەی ناوی چاوگ ‹کردار: کردار› ٢. نیشانەی بکەر یان ئاوەڵناو ‹خریدار: کڕیار›.

**آرا**[1] / ārā/: [عربی] جمعِ ☜ **رأی**

**ـ آرا**[2]: پیواژه. ـ ڕازێن؛ ـ خەملێن؛ ـ ڕازن؛ ـ تەوزێن؛ ـ نەژرن؛ ڕازێنەر ‹بزم‌آرا: بەزم ڕازێن›.

**ـ آرائی** / ārā'î/ ☜ **ـ آرایی**

**آرائیدن** / ārā'îdan/ ☜ **آراییدن**

**آرابسک** / ārābesk/: [فرانسوی]/اسم. لەولاوی؛ ئیسلیمی؛ شێوازێکی هونەرکاری بۆ ڕازاندنەوەی دیوار و میچ و... بەشێوەی گوڵ و بتەی پێچاوپێچ.

**آراستگی** / ārāstegî/، ـها/: اسم. ڕازاوەیی؛ خەملاوی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی ڕازاوە بوون ‹آراستگی سر و وضعش حرف نداشت: ڕازاوەیی بەژن و باڵای قسەی تێدا نەبوو›.

**آراستن** / ārāstan/: مصدر. متعدی.// **آراستی**: ڕازاندتەوە؛ **می‌آرایی**: دەڕازێنیتەوە؛ **بیارا**: بڕازێنەوە// ١. ڕازاندنەوە؛ ڕازاندن؛ ڕازانن؛ ڕازاننەوە؛ ڕازنەی؛ ڕازنای؛ خەملاندن؛ خەملاندن؛ جوان‌کردن؛ تەوزاندن؛ تیف‌تیفە دان؛ نەژرنای؛ نەژرنایش؛ وەش‌کەردەی؛ جوان و لووس‌کردن؛ ڕازاندنەوە بە خشڵ و جلکی جوان ٢. [ادبی] تەکووزکردن؛ تەکویزکردن؛ هەڵپەرتاوتن؛ هەڵوەژارتن؛ ڕێک‌وپێک‌کردن؛ مریس‌کردن؛ پەسارنەی؛ پەسارنای ‹لشکر آراستن: تەکووزکردنی لەشکر›. هەروەها: **آراستنی**

■ صفت فاعلی: **آراینده** (ڕازێنەرەوە)/ صفت مفعولی: **آراسته** (ڕازێنراوە)/ مصدر منفی: **نیاراستن** (نەڕازاندنەوە)

**آراسته** / ārāste/: صفت. ١. خەملاوە؛

خەملاو؛ ڕازاوە؛ جوان‌کراو؛ خەملێو؛ جوان و لووس‌کراو؛ خەملی؛ ڕازیا ‹سر و روی اراسته: سەر و سیمای خەملاوە› ٢. هەڵپەرتاوتە؛ پەساریا؛ تەکووز؛ تەکویز؛ نەژریا؛ هەڵوەژێراو؛ خاوەن ڕێک و پێکی ‹خانەی آراسته: خانووی هەڵپەرتاوتە›.

**آرام**[1] / 'ārām/: *صفت. [ادبی]* ئارام؛ هێمن؛ هێور؛ مەن؛ مەند؛ هارام؛ ئاشاس: ١. کڕ؛ بێ‌شڵەژاوی و تێکەڵاوی ‹کشور آرام: هوای آرام: وڵاتی هێمن؛ هەوای ئارام› ٢. بێدەنگ؛ کش‌ومات؛ ڕپ؛ زریە؛ سوکنا؛ ئامۆش؛ هامۆش؛ هاڵە؛ بێ هەرا و هوریا ‹خانەی آرام: خانووی بێدەنگ› ٣. بێ‌جووڵە؛ ئۆقرەگرتوو؛ هێواش؛ یەواش؛ کپ؛ زەوت؛ زەود؛ کپەنە؛ بێ پەلە و جووڵە ‹حرکت آرام: بزاڤی ئارام› ٤. هێور؛ هێدی؛ هێمن؛ هەدار؛ لەسەرخۆ؛ بەپشوو؛ پشوو لە سەرخۆ؛ سەرخۆ؛ سەماس؛ ئۆخژن؛ توێتکە؛ ئاکارێ بێ‌تووڕەیی ‹اسب آرام؛ مرد آرام: ئەسپی هێدی؛ پیاوی هێمن›.

◘ **آرام بودن:** ئارام بوون؛ هێمن بوون: ١. هێور بوون؛ لە سەر خۆ بوون ٢. ئۆقرە گرتن؛ بێ‌جووڵە بوون؛ ستارگرتن ٣. ئاسوودە بوون.

**آرام گرفتن/ یافتن:** ئارام‌گرتن؛ هێور بوون؛ هەدادان؛ هێمن بوونەوە؛ لاکراسیان: ١. سوکنایی هاتن؛ لە بەین چوونی شڵەژاوی ‹کشور آرام گرفت: وڵات هێمن بووەوە› ٢. سرەوان؛ سرەوەی؛ دامرکان؛ قریان؛ لە بەین چوونی ئێش ‹درد آرام گرفت: ئێشەکە سوکنایی هات› ٣. داکەسیان؛ داسەکین؛ ئەرەکاسیەی؛ دامرکان؛ قورمین؛ دەس کێشان لە جووڵە و هورووژان ‹دیگر آرام بگیر: ئیدی ئارام بگرە›.

**آرام**[2]: *قید.* بە ئارامی؛ گوڤا؛ هێدیکایی؛ هێور؛ بە ئەسپایی؛ بە هێمنی: ١. هێواش؛ بێ‌پەلە ‹آرام برو: بە ئارامی بڕۆ› ٢. لەسەرخۆ؛ بێ دەرخستنی قین و تووڕەیی ‹آرام حرف بزن: بە هێمنی قسە بکە›.

◙ **آرام ـ آرام:** هێدی ـ هێدی؛ نم ـ نمەک؛ ئارام ـ ئارام؛ شێنە ـ شێنەی؛ نمناز؛ گلۆگل.

**آرامبخش**[1] / 'ārāmbaxš/: *ـها/: اسم.* ئارامبەخش؛ سرەوێنەر؛ هەدادەر؛ سوکنایی‌دەر؛ شتێ (وەکوو دەرمان) کە نەخۆش ئارام دەکاتەوە.

**آرامبخش**[2]: *صفت.* ئارامبەخش؛ سرەوێنەر؛ هەدادەر؛ هێورکەر؛ سوکنایی‌دەر؛ بە تایبەتمەندی و توانای ئارام‌کردنەوەوە ‹سخن آرامبخش: قسەی سوکنایی‌دەر›.

**آرامپز** / 'ārāmpaz/: *ـها/: اسم.* ماوڵبورش؛ کەرستەیەکی چێشت‌چێکەرە، نەرم و لەسەرخۆ چێشتەکە دەکوڵێنێ.

**آرامش** / 'ārāmeš/: *اسم.* ئارامشت؛ هەوا؛ هەراس؛ خۆراس؛ ئشاس؛ ئتر؛ ئارا و قارا: ١. هێمنایەتی؛ هێمنایی؛ هێمنەتی؛ هێمنی؛ هێونی؛ ئۆقرە؛ تەناهی؛ هەڤیان؛ سەکامەتی؛ ستار؛ تەبت؛ قارا؛ هەدا؛ وەخژن؛ ئۆخژن؛ قەرار؛ هەندر؛ ئەرەمەردەی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی: *الف)* بزاڤ و جووڵانەوە. *ب)* هەرا و هوریا. *ج)* ئاژاوە ‹آرامش کشور: هێمنایەتی وڵات› ٢. لاچوونی ژان و هورووژان ‹آرامش خود را بازیافت: هەدای بۆ گەڕاوە›.

**آرامش‌طلب** / 'ārāmeštalab/: *ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت.* هێمنایەتی‌خواز؛ هەداخواز؛ خۆراس‌خواز. هەروەها: **آرامش‌طلبی**

**آرامگان** / 'ārāmgān/: *اسم.* نەرمەبایان؛

باگەلی پەڕانپەڕی کەمەرەی گۆی زەوی کە بە هێوری دەشنن.

**آرامگاه** / ārāmgāh'، ـها/:/اسم. ١. گۆڕ؛ گلکۆ؛ قەبر؛ قەور؛ قەبرە؛ زیارەت؛ مەزار ٢. قسن؛ بینایەک کە لە سەر گۆڕ سازکراوە ‹ساختن آرامگاه چند سال طول کشید: دروست کردنی قسن چەن ساڵی خایاند›.

■ **آرامگاه سرباز گمنام**: گۆڕی سەربازی ون؛ گلکۆی سەربازی نەناسراو کە بە یادی تەواوی کوژراوانی شەڕ دروست دەکرێ: **قبر سرباز گمنام**

**آرامی** / ārāmî'/:/اسم. ئارامی: ١. [گفتاری] مەندی؛ هێمنی؛ هێوری؛ مەنی؛ لەسەرخۆیی ‹دریا کمتر به این آرامی بوده: زەریا زۆرکەم بەم مەندیيە بووە› ٢. لە زمانگەلی سامی باکووری ڕۆژاوی ئاسیا کە لە نێوان ٣٠٠ ساڵ پێش لە دایکبوونی عیساوە تا ٦٥٠ی زایینی، لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا باو بووە ‹زبان آرامی: زمانی ئارامی›.

**آرامیدن** / ārāmîdan'/: مصدر. لازم. [ادبی] //**آرامیدی**: سرەویت؛ **می آرامی**: دەسرەوی؛ **بیارام**: بسرەوە// ١. خەوتن؛ خەفتن؛ نووستن؛ وتەی ‹آرامیدن در هوای آزاد: نووستن لە دەرەوە› ٢. سرەوان؛ حەسانەوە؛ حەوانەوە؛ پشوودان؛ پیشدان؛ سرەوەی؛ سیەی؛ سیای؛ پالدانەوە؛ داسەکیان؛ داسرەوتن؛ داسرەوین؛ شەکەتی دەرکردن ‹مثل اینکه اینجا جای آرامیدن نیست: وا دیارە ئێرە جێی حەسانەوە نیيە› ٣. سرەوان؛ سەقامگرتن؛ لەتان؛ وەرکەتن؛ کودان؛ هەندران؛ هەدان؛ لە جم و جووڵ کەوتن ٤. دڵنیا بوون؛ ئارخەیان بوون؛ خاترجەم بوون؛ هەدان؛ هەندران؛ هەدنین؛ دڵ دامەزران (سەرنج: بۆ ماناکانی تری کە لە پێشوودا باو بووە ☜ **آرام؛ آرامش؛ آرمیدن**).

هەروەها: **آرامیدنی**

■ صفت فاعلی: **آرامنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **آرامیده** (سرەواو)/ مصدر منفی: **نیارامیدن** (نەسرەوان)

**آرایش** / ārāyeš'، ـها/:/اسم. ١. جوانکاری؛ خەملان؛ ئاڕایشت؛ ڕازاندنەوە؛ ڕەوش؛ کار یان ڕەوتی خەملاندن ‹آرایش عروس: خەملانی بووک› ٢. جوانکاری؛ خەملان؛ ئاڕایشت؛ ڕازاندنەوە؛ کارێ کە بۆ جوان و تەکووز بوون کراوە ‹آرایش غلیظ او جلب توجه می کرد: ئاڕایشتی توندی سەرنجی ڕادەکێشا› ٣. دەق؛ هەڵپەرتاوتەیی ‹آرایش سپاه: دەقی سوپا›.

■ **آرایش جنگی**: هەڵپەرتاوتەی شەڕ؛ ئاڕایشتی شەڕ.

**آرایش صحنه**: ڕازاندنەوەی شاشە.

■ **آرایش دادن**: تەکووزکردن؛ تەکویز کردن؛ پۆڕاندن؛ خنجکردن؛ قنجکردن.

**آرایش کردن**: ڕازاندنەوە؛ خەملاندن؛ هەڵپەرتاوتن؛ ئەوەڕازنەی؛ وەشکەردەی.

**آرایشگاه** / ārāyešgāh'، ـها/:/اسم. ئاڕایشتگا؛ ئاڕایشگا، جێگایەک کە مووی سەر و چاوی تێدا کورت و ڕێک دەکەنەوە؛ شوێنی جوانکاری ‹ماهی یکبار آرایشگاه می‌روم: مانگێ جارێ دەچمە ئاڕایشتگا›.

■ **آرایشگاه زنانه**: ئاڕایشتگای ژنانە؛ جێگایەک کە لەوێ ژنان دەڕازێننەوە.

هەروەها: **آرایشگاه مردانه**

**آرایشگر** / ārāyešgar'، ـها؛ ـان/:/اسم. ڕازێنەر: ١. جوانکەر؛ جوانکار؛ خەملینۆک؛ خەملێن؛ موویکار؛ دەلاک(بۆ پیاو)؛ کەسێ کە پیشەی ئاڕایشتکردنە. هەروەها: **آرایشگر زنانه** ٢. دیکۆراتۆر؛ خەملێنەر؛ کەسێ کهکاری، ڕازاندنەوەی شوێنێکە.

هەروەها: **آرایشگر صحنه**

**آرایشگری** / ārāyešgarî'/: *اسم*. جوانکاری؛ جوانکەری؛ خەملێنەری؛ ڕازێنەری: ١. کار یان ڕەوتی خەملاندن ٢. پیشەی جوانکەر.

▣ **آرایشگری صحنه**: شاشە ڕازاندنەوە.

**آرایشی** / ārāyešî'/: *صفت*. ئارایشتی؛ پەیوەندیدار یان هاوگەر بە ئارایشتەوە ‹مواد آرایشی: ماکی ئارایشتی›.

**آرایه** / ārāye'، ـها/: *اسم*. ڕازە؛ تەوزە: ١. *[ریاضی]* بەڕیز دانانی بڕێ لە شتان بە پێی ئەندازەیانەوە، لە گەورەوە بۆ چکۆلە یان بە پێچەوانە ٢. *[زیست‌شناسی]* ڕێکخستنی ژینەوەران بەپێی دووریان لە یەکترەوە ٣. *[ادبی]* زانستە وێژەییەکان، بۆ جوان‌کردنی نووسراوە (وەک: بەدیع و مەعانی و...) ‹آرایه‌های ادبی: ڕازە وێژەییەکان›.

**آرایه‌گر** / ārāyegar'، ـها؛ ـان/: *اسم*. ڕازێنەر؛ تەوزێنەر؛ خەملوان؛ خەملێنەر؛ دیکوراتۆر.

**ـ آرایی** / ārāyî'/: *پیواژە*. ـ ڕازێنی؛ ـخەملێنی؛ ـ تەوزێنی؛ کاری ڕازاندنەوە ‹سفره‌آرایی: سفرەڕازێنی›: **ـ آرائی**

**آراییدن** / ārāyîdan'/: *مصدر. متعدی*. //**آرایید:** خەملاندت؛ **می‌آرایی:** دەخەملێنی؛ **بیارا:** بخەملێنە///*[نامتداول]* خەملاندن؛ غەملاندن؛ جوان‌کردن؛ ڕازاندن؛ ڕازاندنەوە؛ تەوزاندن؛ ئەوەڕزنای؛ ڕازنەی؛ وەش کەردەی: **آرائیدن**

**آرتز** / ārt(e)roz'/: [فرانسوی] ☜ **آرترُوز**

**آرتروز** / ārt(e)roz'/: [فرانسوی]/*اسم*. ئارترۆز؛ جۆرێ نەخۆشینە کە دەبێتە هۆی وردەوردە توانەوەی کرۆچەنەی سەر ئێسک‌گەلی لەش: **آرتُرز**

**آرتزین** / ārtez(i)yan'/: [فرانسوی] ☜ چاه آرتزین، **چاه**

**آرتیست** / ārtîst'، ـها/: [فرانسوی]/*اسم*. ١. نیارڤان؛ کۆسەکار؛ شانۆکار؛ ئارتیست ‹آرتیست سینما: نیارڤانی سینەما› ٢. *[نامتداول]* هونەرمەند.

**آرتیست‌بازی** / ārtîstbāzî'، ـها/: [فرانسوی/فارسی]/*اسم*. نیارڤانکاری؛ کارگەلی نائاسایی، سەرسووڕێنەر و شانۆیی (وەک بازدان بە سەر بان و دیواردا، ئاژۆتن بە خێرایی زۆرەوە و...) کە لایەنی خۆ نواندنیان تێدایە.

**آرتیستی** / ārtîstî'/: [فرانسوی] *صفت*. نیارڤانی؛ کۆسەکاری.

**آرتیشو** / ārtîšû'/: [فرانسوی]/*اسم*. کنگر فرنگی ☜ **کنگر**

**آرد** / ārd'، ـها/: *اسم*. ئارد؛ هارد؛ هەرد؛ ئار؛ هاردی: ١. دەغڵی هاڕدراوی ئامادەی کردنە هەویر بۆ نان ‹آرد گندم: ئاردی گەنم› ٢. شتێ کە وەک ئارد هاڕدرابێ ‹آرد استخوان: ئاردی ئێسک›.

▣ **آرد استخوان**: ئێسکە پرووسکە؛ ئاردە پێشە؛ ئاردی ئێسک.

▣ **آرد به دهان داشتن**: *[تعریض]* دەم دووریان؛ لاڵ بوون؛ لاڵ و پاڵ بوون؛ دەم قووچانن؛ دەم قووچاندن؛ دەم چوونە کلێلەوە؛ مۆمیایی لکەی دەمەرە؛ بە پێچەوانەی بەرژەوەندی و پێداویستی، بێدەنگ بوون و هیچ نەگوتن ‹مگر آرد به دهان داشتی که صدایت درنیامد؟: مەگەر دەمت دوورابوو وا دەنگت دەرنەهات؟›.

**آرد کردن**: هاڕین؛ ڤەهاڕین؛ هێڕاندن؛ هێڕین؛ هاڕاندن؛ هاڕەی؛ هێڤن؛ یەردە؛ گژمراندن؛ کردنە ئارد.

**آرد را بیختن و آردبیز/ الک را آویختن**: *[کنایی]* ئارد تەقاندن و سۆسی ڕژاندن؛ هاردی وێتەی وسوێ متەی؛ کۆتایی هێنان بە کار و پاڵدانەوە ‹من آردم را بیخته و آردبیزم را آویخته‌ام، شما غصه‌ی خودتان را

بخورید: من ئاردەکەم تەقاند و سوسەشم رژاند، ئێوە خەفەت بۆ خۆتان بخۆن›.

**آردالو / ārdālû'/**: *اسم.* پیازاو؛ ئاردەوا؛ پەلولە؛ جۆرێ چێشتە کە ئاردی تێدەکەن: **آرداله**

**آرداله / ārdāle'/** ☜ **آردالو**

**آردبیز** [1] **/ ārdbîz'، ـها/**: *اسم. [ادبی]* هێلەگ؛ هێلەک؛ ئێلەک؛ ئێلەگ؛ هێلەکە؛ ئێلەگ؛ بێژن؛ بێژنگ؛ موخل؛ مۆخڵ؛ قەلبیر؛ زوخمە؛ سوخمە؛ وێچنە (بۆ خەلە)؛ کەمە (بۆ خاک)؛ ئامرازی دابێژتن.

**آردبیز** [2]: *صفت.* ئاردبێژ؛ ئارددابێژ؛ هاردوێچ؛ ئاردێز؛ ئاردڤێز؛ ئێلەک؛ هێلەک؛ ئێلەگ؛ زوخمە؛ بە لێهاتوویی دابێژتنی ئاردەوە.

**آردل / ārdel'، ـها/**: [روسی] *اسم. [قدیمی]* ١. فەرمانبەری بانگیشتن ٢. ئاردەڵ؛ باب نۆگە؛ گزیر؛ زوات؛ ڕاوێژکەری خان؛ گەورە نۆکەری خانی خانان.

**آردوارک / ārdvārk'، ـها؛ ـان/**: [انگلیسی] *اسم.* ئاردوارک؛ خێروخۆر؛ گیانلەبەری گوانداری گەورەی مێروولەخۆر، لە ڕیزی بێددانان، بە لمبووزی درێژەوە.

**آردواز / ārdvāz'، ـها/**: [فرانسوی] *اسم.* ئاردواز؛ لە بەرهەمگەلی سیمان و پەمووی نەسۆچ، بۆ داپۆشانی سەربانان.

**آردولف / ārdvolf'، ـها؛ ـان/**: [؟] *اسم.* ئاردۆلف؛ گیانلەبەری گوانداری ئافریقایی لە تیرەی کەمتیارگەل.

**آردی / ārdî'/**: *صفت.* ئاردین؛ ئاردی؛ هاردی؛ هەردی؛ ئاری: ١. خاوەن دۆخ یان چۆنیەتی بە ئاردەوە بوون ‹سنجد دارای درونبر آردی است: سرینچک ناوەرۆکی ئاردینە› ٢. ئارداوی؛ هارداوی؛ تێکەڵ و ئاوقای ئارد ‹لباسم آردی شد: جلەکەم ئارداوی بوو› ٣. ئاردەمەنی؛ ئاردینە؛ بەرهەمی ئارد ٤. *[گیاەشناسی]* ئاردانە؛ داپۆشراو لە تۆیەکی ناسکی ئاردئاسادا.

**آردینه / ārdîne'/**: *اسم.* بنیە؛ هەویرێکی تێکەڵاو لە ئارد، هێلکە و خوێ کە بڕێ لە گۆشتگەلی (وەک ماسی) بۆ بەرگری لە شیبوونەوەیان، بەرلە سوورکردنەوە، تێی دەگلێنن: **بُنیه**

**آرزو / ār(e)zû'، ـها/**: *اسم.* ئاوات؛ ئارەزوو؛ ئارزی؛ هیوا؛ کەلکەلە؛ کەلکەڵ؛ دڵخوازی؛ حەز؛ تاو؛ تاسە؛ ئاوەخت؛ ئاڤەزت؛ ڤین؛ قەشقە؛ کام؛ خولیا؛ کاو؛ هێوی؛ هێڤی؛ ئاڵها؛ تەما؛ مگێز؛ واز؛ هومێد؛ نیاز؛ هەرس؛ هەز؛ هەسر؛ هەژ؛ مراد؛ قرم؛ قیتک: ١. هاش؛ ویستی بەهێز بۆ بەدەس هێنانی شتێکی گرینگ ‹تنها آرزوی آنها این بود که به وطنشان بازگردند: تەنیا ئاواتیان ئەمە بوو کە بگەڕێنەوە بۆ زێدەکەیان› ٢. بابەت یان ئارمانجی ئاوەها خوازیارییەک ‹آرزوی تو چیست؟: ئاواتی تۆ چیە؟›.

▣ **آرزوی خام**: خەیاڵپڵاو؛ فاک و فیک؛ ئاواتی بێخۆ؛ خەیالی خاو؛ خەیالی بەتاڵ؛ خەیالی کاڵ.

**آرزوی دور و دراز**: ئاواتی دوور و درێژ؛ ئاواتێک کە بەدیهاتنی زۆر دژوارە.

**آرزوی محال**: ئاواتی نەهاتی؛ ئارەزووی ئەستەم؛ وازێ کە گەز نابێ.

▣ **آرزو برآوردن**: بە ئاوات گەیاندن؛ بە مراو گەیاندن؛ ئاوات بەگا ئاردەی ‹سرانجام آرزویش را برآورد: ئاخری بە ئاواتی گەیاند›.

**آرزو بە دل ماندن**: *[مجازی]* داخ بە دڵەوە مان؛ بە کام نەگەیشتن ‹آرزو بە دلم ماند یکبار ببینم تو درس می‌خوانی: ئەو داخەم بە دڵەوە ما جارێ بتبینم کە دەرس دەخوێنی›.

**آرزو بە گور بردن**: *[مجازی]* داخ بە گڵ بردن؛ ئاوات بردنە ژێر گڵ؛ داخێ بە

قیامەت بەردەی؛ بە ناکامی مردن ‹مگر این آرزو را به گور ببرد که با دختر من ازدواج کند: مەگەر ئەم داخە بەگڵ بەرێ کە لەگەڵ کچی مندا زەماوەن بکا›.

**آرزو پختن:** *[نامتداول]* ئاواتی دوورکردن.

**آرزو خوردن:** *[نامتداول]* تەما برین؛ دەس لە ئاواتی خۆ بەردان.

**آرزو داشتن/ کردن:** بە ئاواتەوە بوون؛ ئاواتەخواز بوون؛ ئاوات خواستن؛ ئارەزوو کردن؛ هێڤی کرن؛ ڤیتن؛ واشتەنە؛ حەز لێکردن؛ هەژیکرن؛ واز لێ بوون؛ دڵ پێوە بوون؛ ئارەزوومەن بیەی ‹آرزو داشت یکبار دیگر آن شهر را ببیند: بە ئاواتەوە بوو، جارێکیتر ئەو شارە ببینێ›.

**آرزوی کسی بودن:** ئاواتەخواز بوونی کەسێک؛ ئاوات/ ئارەزووی کەسێ بوون ‹همه آرزویشان است که اینطور پسری داشته باشند: گشتیان ئاواتەخوازن ئاوەها کوڕێکیان هەبێ›.

**به آرزوی خود رسیدن:** بە ئاواتی خۆ گەیشتن؛ بە مرای دڵ گەیین؛ دەسکەوتنی شتێکی ئاواتی ‹سرانجام به آرزویش رسید و به دانشگاه رفت: ئاخری بە ئاواتی گەیشت و چووە زانستگا›.

**آرزوانه** / 'ār(e)zûvāne/ ☜ **ویارانه**

**آرزوبەدل** / 'ār(e)zûbedel/: *صفت. [گفتاری]* نامراد؛ بێمراد؛ ناکام؛ ئاوات بە دڵ؛ داخ بە دڵ؛ داخ لە دڵ ‹ممکن است همینطور آرزو به دل بمانی: ڕەنگە هەروا نامراد بمێنیتەوە›.

**آرزومند** / 'ār(e)zûmand/، ـها؛ ـان/: *صفت.* ئاواتخواز؛ ئاواتەخواز؛ ئاوەتەواز؛ ئارەزوومەند؛ ئارەزوومەن؛ بە ئاوات؛ ئارەزووکەر؛ بە ئارەزوو؛ هیوادار؛ هێڤیدار؛ بە هومێد؛ هیواخواز؛ دڵبەستە؛ دڵ بە تاسە؛ ئاواتمەتێ؛ داڤەگر؛ بە هەویا؛ تاسەمەند؛ تامەزرۆ؛ دلارزوو؛ ئەزرەتمەن؛ تاسەخواز؛ هەزکەر؛ لهێڤی؛ کاسۆتی؛ دڵبژۆک ‹آرزومند موفقیت شما: ئاواتەخوازی سەرکەوتنی ئێوە›.

**آرزومندی** / 'ār(e)zûamandî/: *اسم.* دڵبژۆکی؛ تاسە؛ ئاواتەخوازی؛ تامەزرۆیی؛ ئارەزوومەندی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بە ئاواتەوە بوون ‹سحر با باد می‌گفتم حدیث آرزومندی: بەیان دەمدا بە دەم باوە هەواڵی دڵبژۆکی خۆم›.

**آرژانتیت** / 'ārjāntît/: [فرانسوی] *اسم. [کانی‌شناسی]* ئارژانتیت؛ بەردی زیو؛ بەردێکی سروشتیە، زیوی لێ بە دەس دێ.

**آرسنیک** / 'ārsenîk/: [فرانسوی] ☜ **آرسِنیک**

**آرشه** / 'ārše/، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ئارشە؛ چێوێ باریک کە ڕیشالگەلێ لەمسەریەوە تا ئەوسەری کێشراوە بۆ ژەندنی تاقمێ لە سازە ژێدارەکان.

**آرشیتکت** / 'āršîtekt/، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* نژیاروان؛ ئارشیتێکت؛ میعمار؛ خانووکار.

**آرشیو** / 'āršîv/، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ئارشیڤ: ١. شوێنی ڕاگرتنی بەڵگە و پەرتووک ٢. خەزێنەی بەڵگەیان.

**آرشیویست** / 'āršîvîst/، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ئارشیڤیست؛ بەرپرسی ئارشیڤ.

**آرغ** / 'āroq/ ☜ **آروغ**

**آرکئوپتریکس** / 'ārke'opetrîks/، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ئارکیئۆپێتریکس؛ پەلەوەرێکی زلپەیکەری خولی دووهەمی زەوینناسی.

**آرگن** / 'ārgon/: [فرانسوی] *اسم.* ئارگون؛ توخمی کیمیایی، بە ژمارەی ئەتومی ١٨ و کێشی ئەتومی ٣٩/٩٤، کە گازێکی بە بێ ڕەنگ و بۆیە.

**آرم** / 'ārm/، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* نیشانە؛ ئارم؛ دروشم؛ هەوە؛ نیشانەی تایبەتی

ڕێکخراوەیەک یا هەر جێگایەکی دیکە، بە شێوەی نووسراوە یان وێنە.

**آرماتور** / ʾārmātor، ـها/: [فرانسوی]/اسم. *[معماری]* ئاڵماتور؛ هەرکام لەو میلە کانزاییانە وا لە خانووکردنەوەدا بۆ ناو بیتون بە کار دەڕوا.

**آرماتوربندی** / ʾārmātorbandî، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. ئاڵماتوربەندی؛ کاری دانانی میلەی کانزایی (ئاڵماتور) لە نێو بیتوون؛ بە مەبەستی پتەوترکردنی.

**آرمادیلو** / ʾārmādîlo، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ئارمادیلۆ؛ گوانداریکی گچکەی گشتەخۆری دەڤەری ئامریکا.

**آرمان** / ʾārmān، ـها/:/اسم. ئامانج؛ ئارمانج؛ ئارمان؛ گاڤین؛ هەنی؛ دۆز؛ ئەوەی کە کەسێ یا گرووپێ، پێگەیشتنی بە مەبەستی مەعنەوی و ناوەڕۆکی خۆی دەزانێ ‹آرمان دینی؛ آرمان سیاسی: ئارمانجی دینی؛ ئامانجی ڕامیاری›.

**آرمانخواه** / ʾārmānxāh، ـان/: صفت. ئامانجخواز؛ ئارمانخواز؛ ئارمانواز؛ خوازیاری گەیشتن بە ئارمانی خۆ ‹انسان آرمانخواه: مرۆڤی ئارمانخواز›.

**آرمانخواهی** / ʾārmānxāhî، ـها/:/اسم. ئامانجخوازی؛ ئارمانخوازی؛ ئارمانوازی؛ دڵبەستەیی بە ئارمانێکی دیاریکراو و هەوڵ دان بۆ پێگەیشتنی ‹شور آرمانخواهی در جوانان به چشم می‌خورد: تاوی ئامانجخوازی لە گەنجەکاندا دیارە›.

**آرمانشهر** / ʾārmānšahr، ـها/:/اسم. ئارمانشار؛ کەسنەزاناوا؛ شارێکی خەیاڵی، خاوەن قانوون و حکوومەت و کۆماری دڵخواز: **مدینەی فاضلە؛ ناکجاآباد**

**آرمانگرا** / ʾārmāngerā، ـها؛ ـیان/: صفت. ئامانجەوگر؛ دۆزخواز؛ ئیدیالیست.

**آرمانگرایی** / ʾārmāngerāyî، ـها/:/اسم. ئامانجەوگری؛ دۆزخوازی؛ ئیدیالیسم.

**آرمانی** / ʾārmānî/: صفت. ئارمانی؛ خوازراو ‹جامعەی آرمانی: کۆمەڵگای ئارمانی›.

**آرمیدن** / ʾārāmîdan/: مصدر. لازم. *[ادبی]* //**آرمیدی**: سرەوتی؛ **می‌آرامی**: دەسرەوی؛ **بیارام**: بسرەوە// ١. سرەوتن؛ هەڤان؛ هەڤیان؛ قریان؛ قورمین؛ لەتان؛ ئوقرەگرتن؛ ئارامگرتن؛ حەسانەوە؛ سیەی؛ سیای؛ سرەوەی؛ سرەوای؛ داسەکنان ٢. دامرکان؛ داتەمران؛ لە کوڵ نیشنەوە؛ لە کەف و کوڵ کەوتن؛ لە تین و تاو کەوتن؛ کاسیایرە؛ ئەرەکاسیەی ٣. خەوتن؛ خەفتن؛ نووستن؛ وتەی ❋**آرامیدن**

■ صفت فاعلی: **آرامندە** (ـ)/ صفت مفعولی: **آرمیدە** (سرەوتوو)/ مصدر منفی: **نیارمیدن** (نەسرەوتن)

**آرمیدە** / ʾārāmîde، ـها؛ ـگان/: صفت. ١. ئوقرەگرتوو؛ داسەکاو؛ ئارام؛ بێجوولە؛ بێبزاڤ؛ مەن؛ ئەرەکاسیا ‹آهوی آرمیدە: ئاسکی داسەکاو› ٢. *[کنایی]* خەوتوو؛ خەفتگ؛ نووستوو.

**آرنج** / ʾārenc, ʾāranc، ـها/:/اسم. ئەنیشک؛ هەنیشک؛ ئانیشک؛ هانیشک؛ قۆلانیسک؛ قوڕانیسک؛ قنانیسک؛ کونارشک؛ هەنیشخ؛ هەرەژنێ؛ مرک؛ میرک؛ زەنگە؛ باڵنج؛ لاشاخ؛ بەلەچەق؛ ئانیسک؛ هانیسک؛ هەنیسک؛ بەلەمرک؛ بەندی نێوان قۆڵ و باسک لە دەرەوە.

**آرواره** / ʾārvāre، ـها/:/اسم. شەویلکە؛ شەویلاکە؛ شەویلاک؛ شەویلە؛ شەویلەکە؛ شەوی؛ کاکیلە؛ کاکیلکە؛ کارێز؛ کازێر؛ ئاروو؛ ئارۆ؛ لاچناکە؛ لاچلاچ؛ لاچلاچک؛ هاروو؛ هاروە؛ ئەملا و ئەولای چەنە؛ هەرکام لە دوو پێشەی بان و خواری دەم ❋**فک**

◙ آروارەی بالایی ☜ آروارەی زبرین

آروارەی پایینی ☜ آروارەی زیرین

**آروارەی زبرین**: شەویلەی سەروو؛ هارووی بان؛ پێشەی سەرووی دەم: **آروارەی بالایی**

**آروارەی زیرین**: شەویلەی خواروو؛ هارووی خوارین؛ پێشەی خوارووی دەم: **آرواره پایینی**

**آروارەدار** / ārvāredār'/: *صفت.* پەلێک لە گیانلەبەرانی بڕبڕەدار، بە شەویلکەی جووتەوە.

**آروبند** / ārûband'، ـها؛ ـان/: *اسم. [نامتداول]* شکستەبەن؛ شکسەگر؛ کەسێ کە ئێسکی شکاوی لەش تێک دەخاتەوە.

**آروبندی** / ārûbandî'، ـها/: *اسم. [نامتداول]* شکستەبەنی؛ شکسەگری؛ تێک خستنەوەی ئێسکی شکاوی لەش.

**آروغ** / āruq'، ـها/: *اسم.* قرپ؛ قورپ؛ قڕقێنە؛ قولقێنە؛ پرقێنە؛ قوژپێنە؛ قورپینە؛ قورقێنە؛ قرقینە؛ قولپک؛ وەربوق؛ یەق؛ ئارشک؛ بڕی؛ قرپەی گەروو کە زۆرتر دوای زۆر خواردنەوە دێت: **آرغ؛ آرُوق**

◙ آروغ بی‌جا زدن: *[تعریض]* خۆ تێکوتان؛ خۆ تێهەڵقولتان ‹باز تو آروغ بی‌جا زدی؟: دیسانەوە خوتت‌تیکوتا؟›.

**آروق** / āruq'/ ☜ **آروغ**

**آروماتیک** / āromātîk'، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* ئارۆماتیک: ١. بە چێژ یان بۆنی گیرۆ و بەهێز ٢. *[شیمی]* خاوەن یەک یان چەند جەغزی بەنزەنی.

**آره** / āre'/ ☜ **آری**

**آری**[1] / ārî'/: *اسم.* بەڵێ؛ بەلێ؛ بەلی؛ بەلێ؛ بەرێ؛ ئەرێ؛ ئەری؛ بەری؛ هەرێ؛ ئارێ؛ ئاری؛ ئێ؛ ئا؛ با؛ قەی؛ وەرامی ئەرێنی و پەسندکەر ‹عروس خانم آری را گفت: بووکەکە بەریی گوت›.

◙ آری گفتن: بەڵێ‌کردن؛ ئەرێ گوتن؛ ئەرێ واتەی؛ پەسندکردن و بە ڕاست زانین.

**آری**[2]: *قید.* بەڵێ؛ بەلێ؛ ئەرێ؛ ئارێ: ١. نیشانەی هاوڕایی و بڕوا پێکردن ‹پرسیدم: می‌آیی؟ گفت: آری: پرسیم: دێی؟ وتی: ئەری› ٢. نیشانەی پاداگری و دڵنیایی ‹آری، اینچنین بود برادر: ئاری، برا! وا ڕابرا› ❋ **آره** *[گفتاری]*

**آریا** / ār(i)yā'، ـها/: *اسم.* ئاریا: ١. بەشێ گەورە لە ڕەگەزی سپی‌پێست بریتی لە ئێران و هێند و بەشێ گەورە لە ئەورووپا ٢. [ایتالیایی] *[موسیقی]* بەشی سەرەکی و بە ئاهەنگی ئۆپێرا. بەرانبەر: **کُر**

**آریائی** / ār(î)yā'î'/ ☜ **آریایی**

**آریانیسم** / ār(î)yānîsm'/: [؟] *اسم.* ئاریانیسم؛ ئایینێ کە کەشەیەک بە ناوی ئاریووس (دەوروبەر ٢٥٠-٣٣٦ی زایینی) دایهێنا و لەسەر ئەو بڕوایە کە عیسا نە لەگەڵ بابی (خودا) بەرامبەرە نە وەک ئەو هەتاهەتاییشە.

**آریایی** / ār(î)yāyî'/: *صفت.* ئاریایی؛ پەیوەندیدار یا هاوگەر بە ڕەگەزی ئاریاییەوە ‹نژاد آریایی: ڕەگەزی ئاریایی›: **آریائی**

**آریستوکرات** / ārîstok(e)rāt'، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* ئاریستۆکرات؛ هاوگەر یان بەسراو بە چینی زلپایەوە.

**آریستوکراسی** / ārîstok(e)rāsî'، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ئاریستۆکراسی؛ ڕژێمی ئاغەواتی.

**آز** / āz'/: *اسم. [ادبی]* ئاز؛ چاوچنۆکی؛ خوازەلۆکی؛ تەما؛ هەلپە؛ هەلپ؛ هومێد و داوای ناڕەوا بۆ بەدەس هێنانی شتی زۆرتر،

تەنیا بە مەبەستی دارابوونیان، نەک بۆ کەڵک لێوەرگرتنیان.

**آزاد**[1] / 'āzād، ـها/: اسم. ئازاد؛ داری هورمان لە تیرەی نارەوەن: **آزاد دار؛ آزاد درخت**

**آزاد**[2]: صفت. ئازاد: ١. وەهیر؛ سەربەست؛ سەرازا؛ سەربەس؛ سەربەخۆ ‹من آزادم: من ئازادم› ٢. ئاسایی و سروشتی ‹حرکت آزاد: جوولانەوەی ئازاد› ٣. بەرهەڵدا؛ وڵ؛ بێ بەند و گرێ یان کەرەسەی بەرهەڵست ‹سر آزاد طناب: سەری ئازادی تەناف› ٤. رزگار؛ سەربەس؛ رها؛ رەها؛ رستگار؛ رسگار؛ وڵ؛ دووری یا جیایی لە شتێکی ناخۆش ‹آزاد از غم: رزگار لە خەم› ٥. بێبارش و قۆرت ‹فضای آزاد: جێگای ئازاد› ٦. بێبەرگری ‹عبور آزاد: هاتوچووی ئازاد› ٧. بەتاڵ؛ بێهۆکاری داگیرکەر ‹وقت آزاد: کاتی ئازاد› ٨. بە بێ قانوونێکی تایبەت ‹کلاس آزاد: کلاسی ئازاد› ٩. غەیری دەوڵەتی ‹شغل آزاد: پیشەی ئازاد›.

⊡ **آزاد ساختن:** ئازادکردن؛ رزگارکردن؛ داقەرساندن ‹جنگهای داخلی آمریکا، بردگان را آزاد ساخت: شەرە ناوخۆییەکانی ئەمریکا، کۆیلەکانی رزگار کرد›.

**آزاد شدن:** ئازاد بوون؛ رزگار بوون؛ رەها بیەی: ١. خەلاس بوون؛ داخەلسان؛ خەلستن؛ فلتین؛ داقەرسان؛ قەرسین؛ رزگار بوون لە بەند ‹دیروز از زندان آزاد شد: دوێنێ لە بەندیخانە ئازاد بوو› ٢. لاچوونی بەرگری لە شتێ ‹عبور از از خیابان آزاد شد: هاتوچۆ لە شەقام ئازاد بوو›.

**آزاد کردن:** ئازادکردن؛ رزگارکردن: ١. راهیکردن؛ وەردەی؛ داخەلساندن؛ قەرساندن ‹مردم به زندان ریختند و زندانیان را آزاد کردند: خەڵکی رژانە گرتووخانەوە و بەندیەکانیان ئازاد کرد› ٢. لێخۆشبوون؛ بووردن؛ لێبوورین؛ چنە وەش بیەی ‹به مناسبت عید، عده‌ای از زندانیان را آزاد کردند: بە بۆنەی جەژنەوە، تاقمێ لە بەندیەکانیان ئازاد کرد› ٣. بەر هەڵداکردن * **آزاد گرداندن**

**آزاد گذاشتن:** مەودا پێدان؛ دەرفەت پێدان؛ کۆسپ دانەنان؛ وەرپەنگ نەدەی ‹او را آزاد گذاشت تا هر طور می‌خواهد کار کند: مەودای پێدا تا هەرچۆنێک دەیەوێ کاربکات›.

**آزاد گرداندن** ☜ **آزاد کردن**

**آزاداندیش** / 'āzādandîš، ـان/: صفت. بیرباز؛ ویرواز؛ بیربەرز: ١. بە شێوازی بیرکردنەوەی دوور لە لایەنگری و بەرچاوتەنگی ٢. هۆگر یان پەیرەوی بیربەرزی * **آزادفکر**

**آزاداندیشی** / 'āzādandîšî، ـها/: اسم. بیربازی؛ ویروازی؛ بیربەرزی: **آزادفکری**

**آزادانه** / 'āzādāne/: قید. ئازادانە؛ سەربەستانە؛ بە ئازادی؛ بە شێوازی ئازاد.

**آزاددار** / 'āzād.dār/ ☜ **آزاد**[1]

**آزاددرخت** / 'āzād.deraxt/ ☜ **آزاد**[1]

**آزادراه** / 'āzādrāh، ـها/: اسم. گەورەرێ؛ شارێ؛ ئوتووبان.

**آزادسازی** / 'āzādsāzî، ـها/: اسم. رزگارکاری؛ کار یان رەوتی ئازادکردن، بەتایبەت دەرهێنان لە بەند، گیراوی یا دیلی ‹آزادسازی حلبچه: رزگارکاری هەڵەبجە›.

**آزادفکر** / 'āzādfekr/ ☜ **آزاداندیش**

**آزادفکری** / 'āzādfekrî/ ☜ **آزاداندیشی**

**آزادگی** / 'āzādegî/: اسم. ئازایەتی؛ جوامێری؛ مێرخاسی؛ دۆخ یان چۆنیەتی مێرخاس بوون.

**آزادماهی** / 'āzādmāhî، ـها؛ ـان/: اسم. ماسیئازاد؛ جۆرێ ماسی درێژووکەی خۆش خۆراک: **ماهی آزاد**

**آزادمــــرد** / āzādmard'، ـان/: اسـم. [ادبـی] ئازاپیـاو؛ ڕزگـار؛ جـوامێر؛ مێرخـاس؛ پیـاوێ خـاوەن ئاکـاری لـەبـار و مـەزنانـە. هـەروەهـا: آزادزن

**آزادمـنش** / āzādmaneš'، ـهـا؛ ـان/: صـفت. جـوامێر؛ مرۆچـاک؛ خـاوەن ئاکـاری بـە دوور لە بەدی و بەدخوازی و لایەنگری.

**آزادمنـــــشانه** / āzādmanešāne'/: قیــد. جوامێرانە؛ هاوڕێ لەگەڵ جوامێریدا.

**آزادمنـــشی** / āzādmanešî'، ـهــا/: اسـم. جوامێری؛ دۆخ یان چۆنیەتی جوامێر بوون.

**آزاده** / āzāde'، ـها؛ ـگان/: صفت. سـەربـەتی؛ خاوەن ئاکاری شیاو، دوور لـە بـەرچاوتـەنگـی، خۆویـستی و پێـشداوەری ‹انـسانی آزاده بـود کـه بـه صـاحبان قـدرت سـر فـرود نیـاورد: مرۆیـەکـی سـەربـەتی بـوو کـە بـۆ میرمـەزنـان سـەری دانەنەواند›.

**آزادی** / āzādî'، ـهــا/: اسـم. ئــازادی؛ سـەربـەسـتی؛ سـەربـەسـی: ۱. ڕزگـاری؛ سەربـەخـۆیی؛ بـار و دۆخ یـان چۆنیـەتی ئازاد بوون: *الف)* نـەبـوونی پێویـستی، ناچـاری یـان بـــەرگـــری لـــە بـــەرامبـــەر کـــار یـــان هـــەڵـــبژاردنێکەوە ‹آزادی سیاســی: ئــازادی ڕامیـاری› *ب)* ڕزگـاری لـە کۆیلـەتی، گراویـەتی یان لە ژێر فـەرمـانی کـەسـێدا ‹آزادی از زنـدان: ئـازادی لـە بـەندیخانـەدا› *ج)* ڕزگـاری لـە بـار و دۆخێکی نـاخۆش و نالـەبـار ‹آزادی از بـار قـرض: ڕزگاری لە قـەرز› ۲. هـەبـوونی مـاف یـان ڕێـی کـارکردن بـە پێـی ویـستی خـۆ ‹آزادی انتخـاب: ئازادی هەڵبژاردن›.

▣ **آزادی بحــث و تحقیــق**: ئــازادی بـاس و تۆژینەوە؛ مـافی لێکۆڵـینەوە، وانـە وتنـەوە و گۆڕانەوەی ئازادانەی بیر و ڕای زانستی.

**آزادی دریاهــا**: ئــازادی دەریاگــەل؛ مــافی گــەمیــەوانی لــە دەریاگــەلی ئــازاد لــە دەرەوەی ئـاوە ڕەخیــەکــان، بـۆ هــەمــوو نەتەوەگەل.

**آزادی مــسکن**: ئــازادی خانووبــەرە؛ مــافی هەڵبژاردنی ماڵ لـە هـەر شـوێنێک و مـافی پاراستنی ئەو ماڵە.

**آزادی مــشروط**: *[حقـوق]* ئـازادی بـەمـەرج؛ ئــازادی تاوانبــار لــە بــەندیخانــە بــەهــۆی مەرجگەلێ کە دادگا دیاری دەکات.

**آزادی موقــت**: *[حقــوق]* ئــازادی مــاوەیــی؛ ئازادی بەرتەنگ.

**آزادی‌هـــای چهارگانـــه**: چــوار ئــازادی سـەرەکـی؛ کـە بـریتین لـە: ئـازادی وتـن، ئازادی بیر و بـڕوا، ئـازادی لـە پێداویـستی و ئاتاجی و ئازادی لـە تـرس، کـە بـە بنـەمـای ئازادیگەلی مرۆڤ دەژمێردرێن.

**آزادیخـــواه**[1] / āzādîxāh'، ـهـا؛ ـان/: اسـم. ئــازادیخواز؛ ئــازادیواز؛ ڕزگــاریخواز؛ هــشازا؛ داواکــاری ســەربــەســتی ‹دو آزادیخـواه ایرلنـدی دســتگیر شــدند: دوو ئــازادیخوازی ئیرلــەنــدی قۆڵبەس کران›: **آزادی‌طلب**

**آزادیخـــواه**[2] / ـهـا؛ ـان/: صـفت. ئـازادیخواز؛ ئــازادیواز؛ ڕزگــاریخواز؛ هــشازا؛ لایــەنگــر و هــۆگری ئــازادی ‹روزنامــەی آزادیخــواه؛ ملـت آزادیخــواه: ڕۆژنامــەی ئــازادیخواز؛ نــەتــەوەی ڕزگاریخواز›: **آزادی‌طلب**

**آزادیخواهانـــــه** / āzādîxāhāne'/: صــــفت. ئازادیخوازانــــە؛ ڕزگاریخوازانــــە؛ هــــشازایانە؛ خــاوەن ڕەوشــت یــان شــێوازی ئــازادیخوازی ‹اندیشەی آزادیخواهانە: بیری ئازادیخوازانە›.

**آزادیخـــــــواهی** / āzādîxāhî'/: اســــم. ئــــازادیخوازی؛ ڕزگــــاریخوازی؛ هــــشازایی؛ لایــەنگــری لــە ئــازادی ‹او ســالها بـە جـرم آزادیخـواهی زنـدانی بـود: ئـەو زۆرسـالان بـە تـاوانی ئازادیخوازی بەندی بوو›: **آزادی‌طلبی**

**آزادی طلب** / āzādîtalab'/: [فارسی/ عربی] ☜

آزادیخواه

**آزادی‌طلبی** / 'āzādîtalabî/: [فارسی/ عربی] ☜ **آزادیخواهی**

**آزار** / 'āzār/: *اسم.* ١. ئازار؛ هازار؛ ئاران؛ ڕەنج؛ ڕێنج؛ وەند؛ سوێ؛ ناوەشی؛ ئاکارێک کە ببێتە هۆی ڕەنج، خەفەت یان گەزەنگاز بوونی گیانلەبەرێک ‹رفتارت باعث آزار دیگران است: ئاکارت هۆی ئازاری کەسانی دیکەیە› ٢. *[نامتداول]* نەخۆشی؛ دەرد؛ ئێش؛ ژان ٣. ☜ **آذار**

▣ **آزار به کسی/ چیزی نرساندن**: بە کەسێ ئازار نەگەیاندن؛ هۆی ناخۆشی و زەحمەتی کەسێ نەبوون ‹او آزارش تا به حال به مورچه هم نرسیده: تا ئێستا ئازاری بە میرووڵەش نەگەیشتووە›.

**آزار دادن**: ئازاردان؛ ئەشکەنجە دان؛ ئازارگەیاندن؛ ئازار یاونەی ‹چرا اینقدر او را آزار می‌دهی؟ بۆچی ئەوندە ئازاری دەدەی؟›: **آزار کردن؛ آزار رساندن**

**آزار داشتن**: ئازار بوون؛ ناوەشی بیەی؛ هەبوونی نەخۆشینی دەروونی حەز لە ئازار گەیاندن بە خەڵکی.

**آزار دیدن**: ئازار دیتن؛ عەزیەت بوون؛ ستەم دیتن ‹همیشه از او آزار دیده بود: هەمیشە ئازاری لێ دیبوو›.

**آزار رساندن** ☜ **آزار دادن**

**آزار کردن** ☜ **آزار دادن**

**آزار کشیدن**: ئازارکێشان؛ ڕەنج‌کێشان؛ ئازار چەشتەی ‹چه ازاری کشید: چ ئازاریکی کیشا›.

**آزاراقی** / 'āzārāqî/ ☜ **آذاراقی**

**آزاربلندی** / 'āzārbolandî/ ☜ بیماری ارتفاع، **بیماری**

**آزاردوست** / 'āzārdûst، ـها؛ ـان/: *صفت.* *[روانشناسی]* مازووخیست؛ دوچاری نەخۆشینی مازووخیسم.

**آزاردوستی** / 'āzārdûstî/: *اسم.* *[روانشناسی]* مازووخیسم؛ جۆرە نەخۆشیەکی جنسی- ڕەوانیە کە نەخۆش بە ئازار دیتن لە لایەن لفەکەیەوە، کەیفخۆش دەبێ.

**آزارگر** / 'āzārgar، ـها؛ ـان/: *صفت.* ١. *[روانشناسی]* سادیست؛ جۆرە نەخۆشیەکی جنسی- ڕەوانیە کە نەخۆش بە ئازاردانی لفەکەی کەیفخۆش دەبێ ٢. ڕەنجدەر؛ ئازاردەر.

**آزارگری** / 'āzārgarî/: *اسم.* ١. *[روانشناسی]* سادیسم ٢. ڕەنجدەری؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی ئازاردەر بوون.

**آزارنده** / 'āzārande/: *صفت.* ئازاردەر؛ ڕەنجدەر؛ گەهرێنەر؛ خاوەن بار و دۆخ یان چۆنیەتیەک کە ئەبێتە هۆی ئازاردان ‹صدای آزارنده‌ای داشت: دەنگێکی ئازاردەری بوو›.

**آزبست** / 'āzbest/: [فرانسوی] *اسم.* ئازبێست؛ پەمووی نەسۆچ.

**آزتک** / 'āztek/: [؟] *اسم.* ئازتێک: ١. گەلی سوور پێستی میکزیک ٢. ـها/ هەرکام لەو خەڵکە ٣. زمانی ئەو خەڵکە.

**آزردگی** / 'āzordegî، ـها/: *اسم.* ڕەنجاوی؛ ئازراوی؛ گەهراویەتی؛ دڵێشاوی؛ دڵئێشاوی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی دڵئێشان ‹آزردگی از چهره‌اش پیدا بود: دلیشاوی لە دیمەنیدا دیار بوو›.

**آزردن** / 'āzordan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**آزردی**: ئازاندت؛ **می‌آزاری**: دەئازێنی؛ **بیازار**: بئازێنە// ئازاندن؛ ئازاردان؛ ئازاراندن؛ دڵئێشاندن؛ ڕەنجاندن؛ گەهراندن؛ دڵڕەنجاندن؛ وەزەنەی؛ قەهراندن؛ ئێشاندن ‹از آزردن دیگران لذت می‌برد: لە ئازاردانی خەڵکی کەیف دەکا›. هەروەها:

آزردنی

■ صفت فاعلی: **آزارنده** (ئازاردەر)/ صفت مفعولی: **آزرده** (ئازاردراو)/ مصدر منفی: **نَیازردن** (ئازار نەدان)

**آزرده** / āzorde'، ـگان/: *صفت. [ادبی]* ١. ڕەنجاو؛ گەهراو؛ ئاراو؛ ڕەنجیاگ؛ ڕەنجیاو ‹آزرده دل: دڵ ڕەنجاو› ٢. نەخۆش؛ نەساغ؛ ناکۆک.

◘ **آزرده بودن:** ڕەنجان؛ ڕەنجیان؛ ڕەنجاو و خەمبار بوون. هەروەها: **آزرده شدن؛ آزرده کردن**

**آزردەجان** / āzordecān'، ـان/: *صفت. [ادبی]* داچەکاو؛ مل‌کز؛ دڵ‌بەکوڵ؛ دڵ پڕلەژان؛ چەوساوە؛ کوێرەوەر؛ خاوەن لەشێکی کز بەهۆی کوڵ و کەسەری زۆرەوە.

**آزردەخاطر** / āzordexāter'، ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت. [ادبی]* دڵمەند؛ دڵمەن؛ دڵتەنگ؛ دڵپڕ؛ دڵگران؛ دڵشکاو؛ دڵڕەنجاو؛ دڵ‌جخار؛ شەمزاو؛ ڕەنجاو؛ ڕەنجیاگ؛ دڵ‌ئێشاو ‹نگذار آزردەخاطر از پیش تو برود: مەهێڵە دڵمەند لە لاتەوە بڕوا›: **آزردەدل**

**آزردەدل** / āzordedel' ☜ **آزردەخاطر**

**آزرم** / āzarm'/: *اسم. [ادبی]* ١. ئەدەب؛ هۆرتە؛ شەرم؛ تۆرە ٢. ئابڕوو؛ ئاوڕوو؛ حەیا.

◘ **آزرم داشتن:** بەشەرم بوون.

**آزرمگین** / āzarmgîn'، ـان/: *صفت. [ادبی]* بە شەرم؛ بە حەیا؛ شەرمێون؛ شەرمین.

**آزگار** / āz(e)gār'/: *صفت. [گفتاری]* ڕەبەق؛ خشت؛ تەواو؛ تەخت و تەواو؛ ئازگار؛ پەیوەستە ‹سه سال آزگار: سێ ساڵی ڕەبەق›.

ــ **آزما** / āz(e)mā'، ـیان/: *پیواژە.* ـئەزمە؛ ـزمە؛ ـ هێچێن؛ تاقی‌کەرەوە ‹بخت‌آزما: بەختەزمە›.

ـ **آزمائی** / āz(e)mā'î ☜ ـ **آزمایی**

**آزمایش** / āz(e)māyeš'، ـها/: *اسم.* ئازمایشت؛ ئەزموون؛ هێچ؛ دۆپیەک؛ دپیەک؛ ئەزمشت؛ کار یان چالاکیەک بۆ دۆزینەوەی شتێکی نەناسراو، لێکۆڵینەوە لە دروستی، نادروستی یان سەلماندنی گریمانەیەک.

◘ **آزمایش کردن:** تاقی‌کردنەوە؛ سەنگاندن؛ هەڵسەنگاندن؛ کرێشەیش؛ جەڕمین؛ ئەزموون‌گرتن؛ ئازمایش کەردەی.

**آزمایشگاه** / āz(e)māyešgāh'، ـها/: *اسم.* تاقیگە؛ ئەزموونگە؛ ئازمایشگا؛ جێگەی ئەزموون؛ جێگایەک بە کەرەسەی پێویستەوە بۆ ئەنجامدانی ئەزموونگەلی زانستی و پیشەیی.

**آزمایشگاهی** / āz(e)māyešgāhî'/: *صفت.* ئەزموونگەهی؛ ئەزموونگەیی؛ ئازمایشگایی؛ بەسراو یان پێوەندیدار بە ئەزموونگەوە ‹تحقیقات آزمایشگاهی: لێکۆڵینەوەی ئەزموونگەهی›.

**آزمایشگر** / āz(e)māyešgar'، ـها؛ ـان/: *اسم.* ئەزموونگر؛ ئازمایشتکار؛ تاقی‌کار؛ کەسێ کاری تاقی‌کردنەوە بێت.

**آزمایش‌گرایی** / āz(e)māyešgerāyî'/: *اسم.* ئازمەوگری؛ ڕوانگەیەکی فەلسەفیەکە ئازمایشت بە بنەمای هەر چەشنە ئەنجامێکی مژیوەرانە دەزانێ (شرۆڤە: ئازمەوگری لەگەڵ ئەزموونگەریدا جیاوازن).

**آزمایش‌وخطا** / āz(e)māyeš-o-xatā'/: [فارسی/ عربی] ☜ **آزمون‌وخطا**

**آزمایشی**[1] / āz(e)māyešî'/: *صفت.* ئازمایشتی؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی ئازمایشت ‹پرواز آزمایشی: هەڵفڕینی ئازمایشتی›.

**آزمایشی**[2]: *قید.* ئازمایشتی؛ ئەزموونی ‹چند روزی آزمایشی کار کن تا کارت را ببینیم: چەن ڕۆژێ ئەزموونی کار بکە تا کارەکەت ببینین›.

**ـ آزمایی** / 'āz(e)māyî، ـها/: *پیواژه.* ـ ئەزموونی؛ ـ هێچێنی؛ زمین ‹هوش‌ازمایی؛ بخت‌ازمایی: هۆشەزموویی؛ بەختەزموونی›: **ـآزمائی**

**آزمند** / 'āzmand، ـان/: *صفت.* *[ادبی]* چنۆک؛ چاوچنۆک؛ چاڤ‌چنۆک؛ چاونەزێر؛ چاوبرسی؛ چاڤ‌برسی؛ چڵماس؛ چەڵماس؛ چەڵماسک؛ دەڤبەش؛ پرکێش؛ تەماکار؛ لێشتۆک؛ هەفهەفی ‹مردی ازمند بود: پیاوێکی چاڤ‌چنوک بوو›.

**آزمندی** / 'āzmandî، ـها/: *اسم.* *[ادبی]* تەماکاری؛ چاڤ‌چنۆکی؛ چاوچنۆکی؛ چنۆکی؛ چڵماسی؛ چەڵماسکی؛ چەڵماسی ‹آزمندی نشانەی سفلگی است: تەماکاری نیشانەی بێ‌بایەخیە›.

**آزمودن** / 'āz(e)mûdan/: *مصدر. متعدی.* *[ادبی]* //**آزمودی:** هەڵتسەنگاند؛ **می‌آزمایی:** هەڵدەسەنگێنی؛ **بیازما:** هەڵسەنگێنە// هەڵسەنگاندن؛ سەنگاندن؛ تاقی‌کردنەوە؛ تاقیەوکردن؛ زمین؛ زموون؛ ئەزماین؛ زمنەی؛ زمنای؛ جەڕباندن؛ کرێشەی؛ هۆرسەنگنەی ‹معلومات کسی را ازمودن: زانیاری کەسێ سەنگاندن›.

■ صفت فاعلی: **آزماینده** (هەڵسەنگێنەر)/ صفت مفعولی: **آزموده** (هەڵسەنگێنراو)/ مصدر منفی: **نیازمودن** (هەڵنەسەنگاندن)

**آزمودنی** / 'āz(e)mûdanî، ـها/: *اسم.* ئەزموونی؛ مرۆڤ یا گیانلەبەرێک کە لە لێکۆڵینەوەی زانستیدا ئازمایشت دەکرێ.

**ـ آزموده** / 'āz(e)mûde، ـها؛ ـگان/: *پیواژه.* ـئەزمووده؛ ـدیتوو؛ ـدیتە؛ ـئەزموو؛ ـزمووده؛ خاوەن تەجرەبە ‹کارازموده: کارئەزمووده›.

**آزمون** / 'āz(e)mûn، ـها/: *اسم.* ئەزموون؛ ئەزموونە؛ زمنای؛ هێچان؛ تێست.

▣ **آزمون دیک:** ئەزموونی دیک؛ ئەزموونێ بۆ پەیداکردنی توانای تووش بوونی کەسێ بە نەخۆشی مەخمەڵەک.

**آزمون ورودی:** ئەزموونی هەڵبژاردن؛ ئەزموونێک بۆ هەڵبژاردنی داواکارانی کار یان خوێندن.

**آزمون هوش:** ئەزموونی هۆش؛ ئەزموونێک بۆ دیاری‌کردنی ڕادەی هۆش.

**آزمون‌شناسی** / 'āz(e)mûnšenāsî، ـها/: *اسم.* ئەزموون‌ناسی؛ تۆژینەوەی ئەزموونگەلی شیاو بۆ هەڵسەنگاندنی توانای تاقی‌کراوگەل.

**آزمون‌شونده** / 'āz(e)mûnšavande، ـها؛ ـگان/: *اسم.* تاقی‌کراو؛ تاقیەوکراو؛ کەسێ کە ئەزموونی لێ دەگرن.

**آزمونگر** / 'āz(e)mûngar، ـان/: *اسم.* تاقی‌گر؛ تاقیەوکەر؛ هێچکار؛ کەسێ کاری ئەزموون گرتنە.

**آزمون‌گرایی** / 'āz(e)mûngerāyî/: *اسم.* ئەزموونگرەوی؛ ئەزموونەوگری؛ بنەمای فەلسەفی بڕوامەند بە ئەزموونی هزری، وەک تەنیا سەرچاوەی ئاگایی و ناسین: **اصالت تجربه**

**آزمون‌وخطا** / 'āz(e)mûn-o-xatā، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* کۆمەڵەییەک لە ئازموون یان ئاکاراگەل بۆ گەیشتن بە ئەنجامی دڵخواز یان باشترین ڕێگا، بە لێکدانەوەی ڕێگاکان: **آزمایش و خطا**

**آزمونه** / 'āz(e)mûne، ـها/ ☜ **تست**

**آزمونه‌ای** / 'āz(e)mûne'î/ ☜ **تستی**

**آزوئیک** / 'āzo'îk/: [فرانسوی] ☜ **آزوییک**

**آزوغه** / 'āzûqe/: [ترکی] ☜ **آذوقه**

**آزوقه** / 'āzûqe/: [ترکی] ☜ **آذوقه**

**آزوییک** / 'āzoyîk/: [؟] ☜ **بی‌زیوی: آزوئیک**

**آژان** / 'ājān، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* پاسەوان؛

پاسەبان؛ پاسگر؛ پازگر؛ ئاژان؛ پۆلیس؛ قۆڵچی.

**آژانس** / ājāns'، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ١. نۆینەرایەتی؛ پێشکاری ٢. بنکە؛ بنگە ‹آژانس بیمە؛ آژانس املاک: بنکەی دابین؛ بنکەی خانوو و مڵک› ٣. *[گفتاری]* تاکسی تەلەفوونی.

**آژدار** / ājdār'، ـها/: *صفت*. ١. ئاجدار؛ ئاژدار؛ گڕناڵ؛ ئاژن ٢. دەقدراو؛ ئاژدراو.

**آژنگ** / ājang'، ـها/: *اسم. [ادبی]* لۆچ: ١. چرچ و لۆچ؛ خێچ؛ کوریشک؛ قرچان؛ گرنج؛ گنج ‹چهرەی آژنگ: چاری چرچ و لۆچ› ٢. خول؛ سوور؛ قەمچ و پێچ ٣. ئاش؛ شۆ؛ دەقی پارچە ٤. کەل؛ پێل؛ پێلۆکە؛ پێلێکی چکۆلە کە دە ئاودا بەدی دێت.

**آژه** / āje'، ـها/: *اسم*. دەقدەر؛ ئاژدەر.

**آژیدن** / ājîdan'/ ☜ **آجیدن**

**آژیده** / ājîde'/ ☜ **آجیده**

**آژیده‌دوزی** / ājîdedûzî'/ ☜ **آجیده‌دوزی**

**آژیر** / ājîr'، ـها/: *اسم*. ئاژیر؛ هایدار: ١. دەنگێ بۆ ئاگادارکردن (وەکوو دەنگی بۆق و زەنگ) ‹آژیر آتش‌نشانی: ئاژیری ئاگرتەمرێن› ٢. ئامراز یان کەرەسەیەک بۆ دەرهێنانی ئاوەها دەنگێ.

⊡ **آژیر کشیدن**: ئاژیرکێشان؛ ئاژیر لێدان؛ هایدان.

**آژینه** / ājîne'/: *اسم*. ئاژینە؛ چەکوشی بیرازکردن کە سەرەکەی ددانەی هەیە.

**آس** / ās'، ـها/: *اسم*. ١. [فرانسوی] ئاس؛ تەکە؛ تەک خاڵی وەرەق‌بازی ٢. [فرانسوی] ئاس؛ جۆرێ کایەی وەرەق ٣. [سریانی] ☜ مۆرد سەوز، **مورد** ٤. هار؛ هارە ‹دست آس: دەس‌هار›.

ـــ **آسا** / āsā'/: *پسوند*. ـئاسا: ١. ـیان/ ـحەسێن؛ حەسێنەر ‹تن‌آسا: لەش‌حەسێن› ٢. وەک؛ پیسە ‹دیوآسا: دێوئاسا›.

**آسائیدن** / āsā'îdan'/ ☜ **آساییدن**

**آسامی** / āsāmî'/: *اسم*. ئاسامی: ١. لە زمانگەلی هێندوئێرانی کە لە پارێزگەی ئاسامی هێنددا قسەی پێی دەکەن ٢. ـها؛ ـان/ هەرکام لەو خەڵکە وا بەو زمانە قسە دەکەن.

**آسان**[1] / āsān'/: *صفت*. ئاسان؛ هاسان؛ سانا؛ سەنا؛ هێسا؛ گانگاز؛ سادە؛ سانەهێ؛ ساکار: ١. بێ‌دژواری؛ ڕەحەت ‹درس آسان: وانەی هاسان› ٢. بێ‌نیاز لە تێکۆشان، بیرکردنەوە یان زەحمەتی زۆر ‹کار آسان: کاری ئاسان›
*بەرانبەر: **دشوار**

⊡ **آسان گرفتن**: ئاسان‌گرن؛ هاسان‌گرتن: ١. سەختگیری نەکردن؛ سۆک لێ‌نەوین؛ شل گرتن ‹امسال آزمون را آسان گرفته بودند: ئیمساڵ ئەزموونەکەیان ئاسان گرتبوو› ٢. چاوپۆشی کردن لە دژواری ‹او کارها را آسان می‌گرفت: ئەو کارەکانی ئاسان دەگرت›. هەروەها: **آسان بودن؛ آسان شدن؛ آسان کردن**

**آسان**[2]: *قید*. بە ئاسانی؛ بە سانایی؛ ئاسان؛ هاسان؛ گازنگازی ‹شیشه خیلی آسان شکست: شیشەکە زۆر بە ئاسانی شکا›.

**آسان‌بر** / āsānbar'، ـها/: *اسم*. سانابەر؛ ئاسانسۆڕ.

**آسانسور** / āsānsor'، ـها/: [فرانسوی]/*اسم*. سانابەر؛ ئاسانسۆڕ؛ هۆدەیەک چکۆلە (کە زۆرتر بە کارەبا کار دەکات) بۆ بان و خوار پێ‌کردنی مرۆ یان بار.

**آسانسورچی** / āsānsorčî'، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ ترکی]/*اسم*. ئاسانسۆڕچی؛ سانابەرچی؛ کەسێ کە کاری ڕێخستنی ئاسانسۆڕە.

**آسانگر** / āsāngar'، ـها/: *اسم. [شیمی]* کاتالیزۆر.

**آسانگوار** / āsāngovār، هـا/: صفت. سۆک؛ زوو هەرسەک؛ سانا هەرسەک. بەرانبەر: **دیرگوار (دیرهضم)**

**آسانگیر** / āsāngîr، هـا؛ ـان/: صفت. ١. کەمتەرخەم؛ کەترەخەم؛ بێ وردبینی و دواکەوتن ‹آدم آسانگیر اغلب موفق نمی‌شود: مرۆی کەمتەرخەم زۆر جار سەر ناکەوێ› ٢. ساناگر؛ هاسانگر؛ پێدانەگر ‹استاد ما آسانگیر است: مامۆستاکەمان ساناگرە›.

**آسانگیری** / āsāngîrî، هـا/: اسم. ١. کەمتەرخەمی؛ کەترەخەمی؛ کار یان ڕەوتی ئاسان گرتن ‹آسانگیری تو باعث خراب شدن این بچه شد: کەمتەرخەمی تۆ بوو بە هۆی لارێ بوونی ئەم منداڵە› ٢. [سیاست] ساناگری؛ ئازادی جووڵانەوەی کەسێ لەباری ئاکاری و کردارییەوە تا جێگایەک کە ئازاری بۆ کەس نەبێ. بەرانبەر: **سختگیری**

**آسانی** / āsānî، هـا/: اسم. ئاسانی؛ هێسانی؛ هاسانی؛ سانایی؛ سەناهی. بەرانبەر: **دشواری**

**آسان‌یاب** / āsānyāb/: صفت. سانادۆز؛ هاسان‌دۆز؛ لەبەردەست؛ شتێ کە هاسان دەس‌دەکەوێ ‹این کتابها آسان‌یاب است و در همه جا پیدا می‌شود: ئەم کتێبانە سانادوزن و لە هەموو لا دەس‌ئەکەون›.

**آسایش** / āsāyeš/: اسم. ئاسایشت؛ ئاسوودەیی؛ ئاسۆدەیی؛ شێنی؛ هێسایی؛ تەناهی: ١. شێنەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ئاسوودە بوون ‹آسایش خیال: ئاسوودەیی خەیاڵ› ٢. بار و دۆخێ کە سانەوە و ئارامشت وەدی دێنێ و شەکەتی و پەژارە لە بەین دەبا ‹در آنجا همه‌گونه وسیله و امکان آسایش فراهم است: لەوێدا هەموو شتێک بۆ ئاسایشت تەیارە›.

▣ **آسایش خاطر/ خیال:** دڵتەنایی؛ دڵنیایی؛ ئارخەیانی؛ دڵ‌بجێ؛ ئاسوودەیی خەیاڵ.

**آسایش‌طلب** / āsāyeštalab، هـا؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. چاخەسێوەرێ؛ گانگازخواز؛ ساناویست؛ خوازیاری ئاسوودەیی خۆ و دوورەپەرێزی لە تێکۆشان.

**آسایشگاه** / āsāyešgāh، هـا/: اسم. ئاسایشتگا: ١. حەسانگە؛ حەوانگە؛ جێی حەسانەوە ‹آسایشگاه روانی: ئاسایشتگای ڕەوانی› ٢. خەستەخانە و ڕێخراوەیەک کە تێیدا ئەو نەخۆشانە وا دەرمانیان درێژەی هەیە ڕادەگیردرێن ‹آسایشگاه معلولین: ئاسایشتگای لەش‌ناتەواوان› ٣. بووژانگە؛ دامەزراوەیەک بۆ وچاندان، حەسانەوە و هێز و گوڕ گرتنەوە ‹آسایشگاه تابستانی: ئاسایشتگای هاوینان›.

**آساییدن** / āsāyîdan/: مصدر. لازم. [ادبی] ☜ **آسودن**

**آسبویه** / āsbûye/: [؟] ☜ **سوسَنبَر**

**آسپرین** / āsperîn/: [فرانسوی] ☜ **آسپیرین**

**آسپیرین** / āspirîn، هـا/: [فرانسوی] اسم. ئاسپرین؛ حەبێ کە ئێش دەسرەوێنێ و یاوبڕە: **آسپرین**

**آستاتین** / āstātîn/: [فرانسوی] اسم. ئاستاتین؛ توخمێ کیمیایی ڕادیۆئەکتیڤ، لە گرۆی هالۆژینەکان، بە ژمارەی ئەتومی ٨٥ و کێشی ئەتومی ٢١٠.

**آستان** / āstān، هـا/: اسم. ١. [ادبی] ئاستان؛ ئاسان؛ ئاسانە؛ دەرگانە؛ دەریزانک؛ دەریزان ٢. ئاسانە؛ دەرازینک؛ شیپانێ؛ وەربەرە؛ دەرازوون؛ دەرازین؛ سەردەرانە؛ کەوشکەن؛ ئەو بەشە لە زەوی کە لە درگا نێزیکە ٣. [مجازی] بارەگا؛ کۆشک؛ سەرا.

**آستان‌بوسی** / āstānbûsî، هـا/: اسم. خاک ڕامووسی؛ کار یان ڕەوتی لاشیپانە ماچ‌کردن؛ ماچ‌کردنی ئاستانی خودا یان

گڵکۆی کەسێ ‹بە استان‌بوسی شهدا رفتیم: بۆ خاکراموسی شەهیدان ڕۆیشتین›.
هەروەها: **آستان‌بوس**

**آستانه** / āstāne'/:/اسم. ئاسانە: ١. /ـهـا/ شیپانە؛ ژێردەرانە؛ دەرازوونە؛ دەریزانک؛ دەریزان؛ دەرازین؛ شیفتک؛ پێپنک؛ دەرچک. بەرانبەر: **بلَند** ٢. لاشیپانە؛ لاشیپان؛ بەشی لابەلای دیوار یان کەف لە ژێر دەرک یان دەلاقەوە ٣. /مجازی/ بەردەرک؛ پێش‌ماڵ؛ بەر دەرگا؛ بەرماڵی گەورەماڵان ٤. کەمترین بزوێنەری پێویست بۆ بزاوتنی دەمارێکی هزری ‹آستانەی درد: ئاسانەی ئێش› ٥. لە هەلی هات و نەهاتدا ‹در آستانەی جنگ: لە ئاسانەی شەڕدا›.

**آستر** / āstar'، ـها/:/اسم. ئاستەڕ؛ ئاسەڕ؛ زەخەرە؛ بەرە کەوا؛ هەوبەر؛ هەوجەر؛ هاسەر؛ بەر. بەرانبەر: **رویه** ‹استر جامە: ئاستەری جلک›.

▣ **آستر کردن**: ئاستەڕ بۆکردن؛ ئاسەڕ گرتن؛ ئاسەڕگێرتەی: **آستر کشیدن ـ١**

**آستر کشیدن**: ١. ☜ **آستر کردن** ٢. ئاسەڕ کێشان؛ ڕەنگ یان بەتانە ماڵین بەسەر دیوار یا بوومی نیگارگەریدا ‹دوبار آستر بکش، بعد رنگ بزن: دووجار ئاسەری بکێشە، جا ڕەنگی بکە›.

**آستربدرقه** / āstarbadraqe'، ـها/: [فارسی/عربی]/اسم. ئاسەڕی کتێب؛ پارچە یان قاقەزێکی ئەستووری دوو لاپەڕە، کە لاپەڕەیەکی بە بەرگەوە و ئەو لاپەڕەکەی بە کتێب یان دەفتەرەکەوە چەسپاوە.

**آسترگذاری** / āstargozārî'/:/اسم. ئاسەڕگیری.

**آسترگیری** / āstargîrî'/:/اسم. بەرگ‌گری؛ ئاسەڕگری؛ ئاستەڕگیری؛ کار یان ڕەوتی ئاسەڕگرتن؛ دوورینی ئاسەڕ بۆ جل و بەرگ، لێفە و لەم چەشنەیە ‹سارا لحاف را استرگیری کرد: سارا لێفەکەی ئاسەڕکرت›.

**آستروئید** / āstero'îd'، ـها/: [فرانسوی]/اسم. /نجوم/ هەسارۆک.

**آسترولژی** / āstrolojî'/: [فرانسوی]/اسم. ئەستێرەبژێری.

**آسترونومی** / āstronomî'/: [فرانسوی]/اسم. ئەستێرەناسی.

**آستری** / āstarî'، ـها/: صفت. ئاسەڕی؛ ئاستەڕی؛ تایبەتی ئاستەڕ یان شیاو بۆ ئاسەڕ ‹پارچەی استری: پارچەی ئاسەری›.

**آستیگمات** / āstîgmāt'، ـها/: [فرانسوی] صفت. /پزشکی/ ئاستیگمات، تووشیار بە نەخۆشینی ئاستیگماتیسم.

**آستیگماتیسم** / āstîgmātîsm'/: [فرانسوی] اسم. /پزشکی/ ئاستیگماتیسم؛ جۆرێ نارێکیە لە شەبەکیەی چاودا کە ئەبێتە هۆی لێل بینینی پاژێک لە دیمەنە وا لە بەر چاوە.

**آستین** / āstîn'، ـها/:/اسم. قۆڵ؛ سەردەس؛ سەردەست؛ دەربال؛ هووچک؛ ئەچک؛ هچک؛ هەنگوچک؛ ئەنگوچک؛ گوچک؛ مچگە؛ چلان؛ قرچک؛ لەنگوچ؛ لەنگوچک؛ لەوەندێ؛ لەقەندی؛ ئاسین؛ سۆرانی؛ ئاواسی؛ ئاوسێ؛ قۆڵەکەوا؛ بەشێ لە جل‌وبەرگ کە لە شانەوە تا سەری دەست دادەپۆشێ ‹استین کتش پارە شد: قۆڵ کۆتەکەی دادڕا›.

▣ **آستین بالا زدن**: /کنایی/ قۆڵ لێ هەڵماڵین؛ دەس پێوەدان؛ خۆ لێ هەڵکردن؛ چۆڵێ هۆرکەردەی؛ بە کارێ پەرژان؛ کارێک دەست پێ کردن ‹باید استین بالا بزنی و نان در بیاوری: دەبێ قۆڵی لێ هەڵماڵی و بژیو پەیدا کەی›.

**آستین‌سرخود** / āstînsar(e)xod'/: صفت.

۱. بیٚ‌قوڵ؛ کراسی بیٚ سەردەست کە لە سەر شانەوە داکشاوە ۲. *[مجازی]* سەربەخۆ ‹ریش‌تراش من استین سر خود است و احتیاجی بە برق ندارد: ریش‌تاشەکەم سەربەخۆیە و کارەبای پێویست نیە›.

**آسفالت** / āsfālt/ :[فرانسوی]/اسم. ۱. *[شیمی]* قیر ۲. ئیسفالت؛ قیرتاو؛ تێکەڵاوێک لە قیر و زیخ کە بۆ داپۆشانی ڕێگا و بان بەکار دەڕوا ‹اسفالت خیابان: قیرتاوی شەقام› ✽ **اسفالت**

◘ **آسفالت ریختن:** ئیسفالت ڕژاندن.

**آسفالت شدن:** ئیسفالت بوون؛ قیرتاو بوون؛ ئیسفالت‌کران ‹کوچەی ما هم اسفالت شد: کۆڵانی ئێمەش ئیسفالت‌کرا›.

**آسفالت کردن:** قیرتاوکردن؛ داپۆشینی شوێنیٚ بە ئیسفالت.

**آسفالت‌ریزی** / āsfāltrîzî/ ،ها/: فرانسوی/ فارسی]/اسم. قیرتاوڕێژی؛ ئیسفالت‌کاری؛ ئیسفالت‌ڕێژی؛ داپۆشانی جێگایەک بە ئیسفالت ‹هفتەی پیش کوچە آسفالت‌ریزی شد: حەوتووی پێشوو کووچەکەمان قیرتاوڕێژی کرا›.

**آسفالتکار** / āsfāltkār/ ،ها؛ ان/: فرانسوی/ فارسی]/اسم. قیرتاوکار؛ ئیسفالتکار؛ کەسیٚ کە کاری ئامادەکردن و ڕژاندنی قیرتاوە.

**آسفالتکاری** / āsfāltkārî/ :[فرانسوی/ فارسی]/اسم. قیرتاوکاری؛ ئیسفالتکاری: ۱. پیشەی قیرتاوکار ۲. قیرتاوڕێژی.

**آسفالته** / āsfālte/ :[فرانسوی] صفت. قیرتاو؛ قیرەتاو؛ ئیسفالت‌کراو.

**آسکاریس** / āskārîs/ ،ها/: فرانسوی]/اسم. ئاسکاریس؛ مارمارک؛ جۆرە کرمێکە لە ڕیخۆڵەی مرۆڤ و بەرازدا گەرا دەکا و زۆر دەبیٚ.

**آسم** / āsm/ :[فرانسوی]/اسم. ئاسم؛ گزم؛ تەنگە نەفەسی؛ نەخۆشینی تەنگەنەفەسی و هەناسەسواری: **آسم ریَوی**

◘ **آسم ریَوی** ☜ **آسم**

**آسمان** / ās(e)mān/ ،ها/: اسم. ئاسمان؛ ئەسمان؛ ئەزمان؛ عەزمان؛ ئەزمێن؛ فەلەک؛ بەرزاییەک کە ئەستێرە و مانگ و ڕۆژی لێوە دەبیندریٚ ‹پرندەای در آسمان پرواز می‌کند: پەلەوەریٚ لە ئاسمانەوە هەڵدەفڕیٚ›.

◘ **آسمان بە زمین آمدن:** *[مجازی]* کۆلەکەی ئاسمان ڕووخان؛ ئاسمان ڕمیان/ ڕووخان؛ دنیا ورەی؛ ئاسمان ئامایرە زەمین؛ ڕووداوێکی گرینگ ڕوودان ‹حالا فکر می‌کنی با این کارت آسمان بە زمین می‌آید؟: ئێستە وا دەزانی بەم کارەت کولەکەی ئاسمان دەڕووخیٚ؟›.

**آسمان را بە زمین دوختن/ آوردن:** *[مجازی]* لە دار و بەرد دان؛ هەموو دەرگا کوتان؛ کرد و کۆشی زۆرکردن ‹برای رسیدن بە نامزدش اسمان را بە زمین دوخت: بۆ گەیشتن بە دەزگیرانەکەی لە دار و بەردی دا›.

**آسمان سوراخ شدن:** *[کنایی]* قەومان؛ قۆمیان؛ ئاسمان شەق بەردن؛ ئاسمان ترەکە بەردەی؛ بەڵا یان چۆرتمێکی گەورە ڕوودان.

**از آسمان افتادن/ آمدن:** *[مجازی]* لە لووت فێل داکەفتن؛ زۆر گرینگ و لەبەر چاو بوون؛ ئاسمانەرە وارەی ‹چە فرقی دارد؟ مگر او از آسمان افتادە؟: چ تۆفیرێکی هەیە؟ مەگەر ئەو لە لووت فێل داکەفتگە؟›.

**آز آسمان ریختن/ باریدن:** *[مجازی]* گیای بەهار بوون؛ پەینە بیەی؛ زۆر و زەوەند و بیٚ‌بایەخ بوون ‹مگر پول از آسمان ریختە، کە اینطور خرجش می‌کنید؟: مەگەر پارە گیای بەهارە، ئاوەها خەرجی دەکەن؟›.

**بــه آســمان رســاندن:** *[مجــازی]* گــه‌یاندنــه ئاسمـــان؛ بـــه‌رده‌ی پـــه‌ی ئاسمـــانی؛ زۆر بردنــه ســه‌ره‌وه ‹فریـادش را بــه آسـمان رسـاند: هاواری گه‌یانده ئاسمان›.

**به آسمان رسیدن:** گـه‌یـشتنه قـاپی ئاسمـان؛ به لای خوا گه‌یـشتن؛ یـاوه‌ی هـۆر ئاسمـان؛ زۆر بـه‌رزه‌وه بـوون ‹فریـادم بـه آسـمان رسـید: هاوارم گه‌یشته قاپی ئاسمان›.

**به آسمان رفـتن و بـه زمـین آمـدن:** *[مجـازی]* قـــه‌پ بـــه زه‌ویـــدا کـــردن؛ مـــه‌رده‌ی و سـۆته‌ی؛ پـاداگرتن و سـوور بـوون ‹اگـر بـه آسمان بـروی و بـه زمـین بیـایی، اجازه نمی‌دهم موتورسـوار شـوی: هــه‌رچێکــیش پـاداگری و ته‌نانه‌ت قـه‌پ بـه زه‌ویـدا بکـه‌ی، ناهێـلم سوار موتور ببی›.

**در آســمان جــستن و در زمــین پیــدا کردن:** *[مجــازی]* زۆر بـــه دوای کـــه‌ســـێ یـــان شـــتێکه‌وه بـــوون، بـــه‌لام بـــه هاســـانی دۆزینه‌وه‌ی.

**آسـمان‌پیسه** / 'ās(e)mānpîse/: *اسم.* شـین و مۆر؛ ئاسمانی پڕ له هه‌وری پـه‌لـه‌ـپـه‌لـه، کـه به‌شگه‌لێ له ئاسمان ده‌نێوانیدا دیاره.

**آسـمان‌جـل** / 'ās(e)māncol ، ـهـا/: [فارسـی/ عربی] *صفت.* *[تعریض]* بێ‌لـه‌ش‌پـۆش؛ بـه‌لـه‌نگـاز؛ لات؛ هـــه‌ژار؛ رووت؛ رووتـــه؛ ســـامال‌ســـا؛ سـامه‌لـسا؛ سـلق؛ بـێ‌ئـه‌نـوا ‹مـی‌خـواهی زن آن آدم آسـمان‌جـل شـوی؟: ده‌تـه‌وێ ببیتــه ژنی ئـه‌و کابرا به‌له‌نگازه؟›.

**آسـمانخراش** / 'ās(e)mānxarāš، ـهـا/: *اسم.* ئاسمانگه‌ز؛ ئـه‌ورمـاڵ؛ خانوویـه‌کـی زۆر گـه‌وره که چه‌ن نهۆمی هه‌بێت.

**آســـمان‌دره** / 'ās(e)māndar(r)e/: *اســـم.* کاکـه‌شـان؛ کـه‌شـکه‌شـان؛ کاکێـشان؛ رێکـا کادزا.

**آسمانـسنگ** / 'ās(e)mānsang، ـهـا/: *اسـم.* به‌رداسمان؛ بـه‌ردی ئاسمـانی؛ بـه‌ردێ کـه لـه ئاسمانه‌وه که‌وتبێته سه‌ر زه‌وی.

**آسمان‌غرنبه** / 'ās(e)mānqorombe, -qoronbe، ـها/: *اسم.* *[گفتاری]* هـه‌وره‌گرمـه؛ گـوڕژ؛ گرمـه‌ی گه‌واڵه: **آسمان‌غُرّه**

**آســـــمان‌غـــــره** / 'ās(e)mānqorre/ ☜ **آسمان‌غُرُنبه**

**آســــمانکان** / 'ās(e)mānkān، ـهـــا/ ☜ **آسمانسنگ**

**آســمان‌کلاهــی** / 'ās(e)mānkolāhî، ـهـا/: *[مجازی]* سه‌ربێ‌کلاوی؛ ده‌سبه‌تاڵی.

**آسـمان‌نمـا** / 'ās(e)mān.nemā، ـهـا/: *اسـم.* *[نجوم]* ئاسمانـدۆز؛ ئاسمـان‌نـوێن: ١. هـه‌رکـام له‌و که‌ره‌سانه‌ی وا تـه‌نگـه‌لی ئاسمـانی نیـشان ده‌دا ٢. خانوویـــه‌ک وه‌ک گومـــه‌ز کـــه ته‌نگه‌لی ئاسمانی تێیدا ده‌بینن.

**آسـمان‌نـورد** / 'ās(e)mān.navard، ـها؛ ـان/: *اسم.* ئاسمان‌پێو. هه‌روه‌ها: **آسمان‌نوردی**

**آســـمان‌وریـــسمان** / 'ās(e)mān-o-rîsmān/: *اســـم.* *[مجـــازی]* حـــه‌لـــه‌ق‌ـمـــه‌لـــه‌ق؛ هاتـــه‌ران‌ـپاتـــه‌ران؛ ئاسمـــان و رێـــسمان؛ شێله‌وبێلـه؛ شێـله‌وپێـله؛ هـه‌لـیت و پـه‌لـیت؛ قـسه‌گـه‌لی بـن‌شـڕ و هـیچ بـه سـه‌ریه‌که‌وه نه‌بوو.

▣ **آسـمان و ریـسمان بـه هـم بـافتن:** قـسه‌ی حه‌له‌ق‌ـمـه‌لـه‌ق‌کـردن؛ هـه‌لـیت و پـه‌لـیت گوتن ‹قـدری آسـمان و ریـسمان بـه هـم بافـت و آخــرش هــزار تومــان ازم گرفــت: بــڕێ قــسه‌ی حه‌له‌ق‌ـ مه‌لـه‌قـی کـرد و ئـاخری هـه‌زار تمـه‌نی لێ‌ساندم›.

**آســـــمانه** / 'ās(e)māne، ـهــــا/: *اســـم.* ١. سـایه‌وانـه؛ سـه‌یوانـه؛ سـایه‌وان ئاسـایه‌ک بـۆ خـــه‌ملانـــدنی جێگایـــه‌ک (وه‌کـــوو میحـــرابی مزگـــه‌وت) ٢. *[نامتـــداول]* ئاسمانـــه؛ مـــیچ؛ سرمیچ؛ سه‌قف.

**آسمانی** / âs(e)mânî/': *صفت.* ١. ئاسمانی؛ ئەزمانی؛ سەر بە ئاسمان ‹سنگ آسمانی: بەردی ئاسمانی› ٢. *[مجازی]* پیرۆز ‹پدر آسمانی: بابی پیرۆز› ٣. ئاسمانی؛ شین؛ بە ڕەنگی ئاوی ئاسمانی ‹رنگ آسمانی: ڕەنگی ئاسمانی›.

◘ **آبی آسمانی** ☜ **آبی**[1]

**آسمی** / âsmî/'. ـها/: [فرانسوی] *صفت.* ئاسمی؛ گژمی؛ تووشی نەخۆشی ئاسم هاتوو ‹بیمار آسمی: نەخۆشی ئاسمی›.

**آس‌وپاس** / âs-o-pâs/'. ـها/: *صفت. [گفتاری]* نەدار؛ هەژار؛ کەمدەس؛ دەسکورت؛ ڕووت و ڕەجاڵ؛ ئاس و پەلاس؛ ڕووت و قووت؛ ڕەپ و ڕویت.

**آسودگی** / âsûdegî/'. ـها/: *اسم.* ئاسوودەیی؛ خۆشکایی؛ بێ‌خەمی؛ سەرشکلی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی بێ خەم وخەیاڵ بوون ‹در آنجا در کمال آسودگی زندگی می‌کرد: دەوێدا لەوپەڕی ئاسوودەییەوە دەژیا›.

**آسودن** / âsûdan/': *مصدر. لازم. [ادبی]* //**آسودی:** حەسایەوە؛ **می‌آسایی:** دەحەسێیەوە؛ **بیاسا:** بحەسێوە// حەسان؛ سانەوە؛ حەسانەوە؛ هەسیانەوە؛ حەسیانەوە؛ هەسیانەڤە؛ ڤەهسیان؛ ئەوەسیەی؛ سیایوە: ١. لە خەم دەرباز بوون؛ لە ڕەنج ڕزگار بوون ‹بیاساید از رنج شاه و سپاه: لە ئەرکی شا و سوپا بحەسێتەوە› ٢. ئارام گرتن؛ هەدا دان؛ لە جێگایەک دانیشتن، خەوتن یان مانەوە ‹چندی در آن شهر بیاسود: ماوەیێ لەو شارەدا حەسایەوە› ٣. پشوو دەرکردن؛ وچاندان؛ ڕۆکەتن؛ پاڵدانەوە ٤. هەدرین؛ لە ئەماندا بوون ‹کسی از ستم او نیاسود: کەس لە ستەمی ئەو نەحەسایەوە› ✻ **آساییدن**

■ صفت فاعلی: **آساینده** (ـ)/ صفت مفعولی: **آسوده** (حەساو)/ مصدر منفی: **نیاسودن** (نەحەسان)

**آسوده** / âsûde/'. ـگان/: *صفت.* ئاسوودە؛ هاسوودە: ١. بە ئاسایشت؛ هێسا ‹آسوده حال؛ آسوده خاطر: ئاسوودە حاڵ؛ دڵ ئاسوودە› ٢. سەرسڤک؛ سەحەت؛ ساو؛ حەساو؛ خاوەن هێمنی و ئارامشت ‹زندگی آسوده: ژیانی ئاسوودە›. هەروەها: **آسوده‌بودن؛ آسوده‌شدن؛ آسوده‌کردن**

**آسوده‌حال** / âsûdehâl/'. ـان/: [فارسی/عربی] *صفت.* ئاسوودەحاڵ؛ دارا؛ ماڵدار؛ دەولەمەن ‹مردمی آسوده‌حال بودند و غم نان نداشتند: خەڵکێکی دەولەمەن بوون و خەمی زگیان نەبوو›.

**آسوده‌خاطر** / âsûdexâter/'. ـان/: [فارسی/عربی] *صفت.* دڵئاسوودە؛ دڵڕوون؛ بێ‌خەم؛ دڵنیا؛ دڵتەنا؛ خاترجەم؛ ئارخەیان؛ دڵهەدا: **آسوده‌دل**

**آسوده‌دل** / âsûdedel/' ☜ **آسوده‌خاطر**

**آسوری** / âsûrî, 'âsorî/': *اسم.* ئاسووری؛ ئاشووری: ١. هۆزی سامی خەڵکی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، کە پێشتر «سوریانی»یان پێ دەگوتن و ئێستەش لە ئێران، ئێراق، تورکیە، لوبنان، سووریە و ئامریکادا بڵاون ٢. /ـها؛ ـان/ هەرکام لە کەسانی ئەو هۆزە ٣. زمان و خەتی ئەو هۆزە.

**آسوندار** / âsûndâr/' ☜ **آنجیلی**

**آسه** / âse/': *اسم.* ١. تەوەرە؛ تەوەر؛ گرۆڤەر ٢. بەردی ئاش؛ هارەی ئاسیاو.

**آسی** / âsî/': *اسم.* ئاسی؛ ئالانی؛ لە زمانگەلی ئێرانی ڕۆژهەلات کە ئێستا لە سەر زاری بەشێ چکۆلە لە خەڵکی قەفقازی ناوەندیە: **آلانی**

**آسیا** / âsiyâ/'. ـها//: *اسم.* ١. ئاساو؛ ئاسیاو؛ هەرکام لە دەزگاگەلی جۆراوجۆری هاڕینی

دانەوێڵە ۲. ئاساو؛ ئاسیاو؛ خانوو بەرەیەک کە کۆمای دانەوێڵەی تێدا دەهاڕن ۳. ☜ دندان آسیا، **دندان**

◘ **آسیا به نوبت:** *[کنایی]* ئاسیاو بە نۆرە؛ ئاش بە نۆبە؛ هەر کەسێک لە نۆرەی خۆیدا ‹پسر جان! آسیا به نوبت، اول باید این آقا را راه بیاندازم: کوڕم! ئاسیاو بە نۆرە، سەرەتا دەبێ ئەم پیاوە وەڕێخەم›.

**آسیای آبی:** ئاسیاو؛ ئاشاو؛ ئاسیاو ئاوی؛ ئاشی ئاوی.

**آسیای بادی:** ئاسیاوی بادی؛ ئاساوی وایی.

**آسیای برقی:** ئاسیاوی کارەبایی: **آسیای موتوری**

**آسیای بزرگ:** کاکیلە؛ کاکیلێ؛ هەرکام لە سێ ددانە ژووروووەکانی ناو دەم.

**آسیای چکشی:** دۆڵ؛ جۆرێ ئاسیاوی دەستی سەرداگیراو بە چەند پەڕەی کانزایی تیژەوە کە بە توندی دەخولێنەوە و دەهاڕێنن.

**آسیای سنگی:** هارە؛ هارێ؛ دەسار؛ دەسهار؛ بەردوولک؛ گێرووسە؛ گێرووشە؛ دەستار؛ ئامرازی گەنمکردنە ئارد، بە دوو بەردی لەسەریەک داندراو (بەردەئاش)ەوە کە ئەوی سەرەوویان دەخولێتەوە و گەنمەکە لە نێوانیاندا ورد دەبێ و دەبێتە ئارد.

**آسیای غلتکی:** هارەگلە؛ ئامرازی وردکردنی گەنم و جۆ، بۆ خۆراکی ئاژەڵ.

**آسیای کوچک:** لا کلیلە؛ ددانی لا؛ هەرکام لە دوو ددانە ناوەندیەکانی زار.

**آسیای موتوری** ☜ **آسیای برقی**

◘ **آسیا کردن:** هاڕین؛ داهاڕین؛ هەڕدن؛ هەڕین؛ گەژمراندن؛ گەژمرین؛ هاڕەی؛ ئاسیاوکردن؛ زۆر وردکردن.

**آسیائی** / āsiyā'î/ ☜ **آسیایی**

**آسیاب** / āsiyāb/، ـها/: *اسم.* ئاسیاو؛ ئاساو؛ ئاش؛ ئاشی دەخڵ هاڕین.

**آسیابان**/ āsiyābān/، ـها؛ ـان/: *اسم.* ئاشەوان؛ ئاسیاوان؛ ئاساوان: ۱. خاوەناش؛ میراش؛ قەڕاش؛ خاوەنی ئاسیاو ۲. ئاشەڤان؛ ئاردهەڕ؛ بهەڕ؛ لونیە؛ لووینە؛ کاریگەری ئاسیاو.

**آسیاسنگ** / āsiyāsang/، ـها/: *اسم.* ۱. بەرداش؛ بەردەئاش؛ تەوەن ئاش ۲. *[مجازی]* گابەرد؛ گاشە؛ تاش؛ تەلە سەنگ.

**آسیایی**[1] / āsiyāyî/، ـها؛ ـان/: *اسم.* ئاسیایی؛ هەرکام لە خەڵکی سەربە قوڕنەی ئاسیا و منداڵەکانیان: **آسیائی**

**آسیایی**[2]: *صفت.* ئاسیایی؛ پەیوەندیدار یان سەربە ئاسیاوە ‹کشورهای آسیایی: ولاتانی ئاسیایی›: **آسیائی**

**آسیب** / āsîb/، ـها/: *اسم.* تەگەرە؛ تەمەرە ئاسیب؛ ئاسیو؛ زیان؛ ئازار؛ مزەڕەت؛ گەزەن؛ پێوەر؛ تەوەرە: ۱. ئەوەی کە ئەبێتە هۆی خراپی شتێ ‹آسیب خشکسالی: تەگەرەدی وشکەساڵی› ۲. *[پزشکی]* هەر ڕووداوێ کە لەشساغی تێک ئەدا (وەکوو نەخۆشی) ‹آسیب وارد شده به چشم: ئازارێ کە چاو تووشی بووە› ۳. زەرەر؛ زیان؛ وەزەن؛ وەزن؛ وەزەنگ.

◘ **آسیب دیدن:** زیان دیتن؛ گەزەن دیتن؛ زیان لێ کەوتن: **آسیب رسیدن**

**آسیب رساندن** ☜ **آسیب زدن**

**آسیب رسیدن** ☜ **آسیب دیدن**

**آسیب زدن:** زیان گەیاندن؛ ئاسیب گەیاندن؛ زیان یاونەی لا؛ دۆخی سروشتی تێکدان و خراپکردن ‹به محصولات کشاورزی آسیب زدن: زیان گەیاندن بە دەسهاتی کشتوکاڵ›: **آسیب**

رساندن

**آسیب‌پذیر** / āsîbpazîr'/، ـها؛ ـان/: *صفت.* بێبەرگە؛ گەزنگاز؛ زیانەوین؛ ئامادەیی بۆ گەزەن پێگەیشتن و بێتوانا بۆ بەرگری لە ئاسیب ‹این گُل در برابر سرما اسیب‌پذیر است: ئەم گوڵە لەبەر سەرماوە بێبەرگەیە›.

**آسیب‌پذیری** / āsîbpazîrî'/: *اسم.* بێبەرگەیی؛ گەزنگازی؛ زیانەوینی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بێبەرگە بون ‹اسیب‌پذیری کودکان و سالمندان در شرایط بحران اقتصادی بیشتر است: گەزنگازی منداڵان و پیران لە بواری قەیرانی ئابووریدا زۆرترە›.

**آسیب‌شناس** / āsîbšenās'/، ـها؛ ـان/: *اسم.* خەسارناس؛ ئاسێوناس؛ شارەزای خەسارناسی.

**آسیب‌شناسی** / āsîbšenāsî'/: *اسم.* خەسارناسی؛ ئاسێوناسی: ١. بەشێ لە زانستی بژیشکیە کە لە هۆ و چیەتی نەخۆشینگەل دەکۆڵێتەوە ٢. ناسینی خەسارگەل و هۆکارەکانیان ‹آسیب‌شناسی اجتماعی: خەسارناسی کۆمەڵگایی›.

**آسیستان** / āsîstān'/، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* بەردەست؛ پشتمێر؛ یاریدەر؛ وەرە ویرک؛ وەرێرک.

**آسیمه** / āsîme'/: *صفت. [ادبی]* پەشێو؛ پەرێشان؛ بیربلاو؛ پەریشان؛ پەشۆکاو؛ پەرۆش؛ شێواو؛ شیویا.

**آسیمه‌سر** / āsîmesar'/ ☜ **سَراسیمه**

**آش** / āš'/: *اسم.* ئاش: ١. /ـها/ چێشت؛ شێو؛ ئێرگل؛ چێشتی ئاوەکی کە دانەوێڵەی زۆری تێدایە و چاشنی و ماکی جۆراوجۆری (وەکوو ماست، کەشک، دۆ و...) تێکەڵاوە ٢. ئاوهەڕاڵ؛ هەڵاڵاو؛ ئاوخوێی دەباخی کە چەرمی تێدەخووسێنن.

▣ **آش آبکی:** شلە؛ شلەک؛ شێوی تراو.

**آش ابودردا:** *[فرهنگ‌مردم]* ئاشێ کە بە مەبەستی خۆشبوونەوەی نەخۆش لێدەنێن و بەشی دەکەنەوە.

**آش آلو:** هەرەوەین؛ هەرەوەینە. هەروەها: **آش آبغوره؛ آش ارزن؛ آش جو**

**آش اُماج:** پرپۆڵە؛ ئاشێ کە بە جێگای هەڕشتە، گونکی چکۆڵەی هەویر یان نانی تێدەکەن.

**آش باقلا:** باقلاو؛ شێوی باقلە و ئاو و ڕۆن.

**آش برگ:** دۆخەوا؛ دۆخوا؛ ئاشێ کە بە جێگەی سەوزی، گەڵاچۆنەر و ئەسپەناخ یان لووشە و گیلاخەی تێدەکەن.

**آش برنج:** بەرزە؛ شێوی برنج.

**آش بغرا:** کایلۆش؛ کارۆش؛ ئاشی دۆکەشک و قاورمە و پیازداخ.

**آش بلغور:** برۆیشین؛ برێشین؛ پتپتک؛ پیر خەنیلە؛ گەرماوی؛ ولۆشینە؛ چێشتی شلەوی وردە ساوار.

**آش پرهیز:** شۆرباو؛ شۆروا؛ ئاشێ کە بۆ نەخۆشی لێدەنێن.

**آش پنیر:** زورچە؛ چێشتی پەنیری وشک کە لە ئاودا دەیکولێنن.

**آش پیاز:** پیازاو؛ پیازاوی؛ ئاو و تام؛ شێوی پیواز و ئاو و ڕۆن.

**آش تعزیه** ☜ **آش عزا**

**آش درهم‌جوش** ☜ **آش شله‌قلمکار_٢**

**آش دندانی:** *[فرهنگ‌مردم]* دانوولە؛ دانەکولانە؛ دیانەکولانە؛ ددانەلۆ؛ چێشتی تێکەڵاوی هەمووجۆرە دانەوێڵە و گۆشت وپیواز، کە بەبۆنەی دەرهاتنی هەوەڵین ددانی زارۆوە لێدەنرێ.

**آش دهن‌سوز:** *[کنایی]* شتی زۆر بەنرخ ‹آن شغل آش دهن‌سوزی هم نیست: ئەو کارە شتێکی وا زۆر بەنرخیش نیە›.

**آش رشته:** ئاش‌ڕشتە؛ ئاشێ کە دانەوێڵە

و سەوزی و ڕشتەی تێدەکەن.
**آش سادە:** پیازاو؛ ئاشێ کە گۆشت و چەشنی تێ نەکرێ.
**آش ساک:** ترشاو؛ ئاشی سرکە یان ئاوی نارنج و ئەسپەناخ.
**آش شلەقلمکار:** ١. دانوولە؛ دانەکولانە؛ چێشتێ کە لە هەموو چەشنە دانەوێڵە و سەوزیەکی تێدایە ٢. *[کنایی]* چێشتی مجێور؛ شپرز و شێواو؛ بێسەر و بەر؛ شەقلێ-پەقلێ: **آش درهم جوش**
**آش غورە:** گۆشتاوێک کە بە بەرسیلەوە لێدەنرێ.
**آش‌عزا:** چێشتی پرسە؛ ئاشی ئازیەتباری؛ ئاشوو پەرسانەی: **آش تعزیه**
**آش کشک:** ئاش‌کەشک؛ ئاشێ کە دوای کولاندن کەشکیشی تێدەکەن.
**آش کشک خالە:** *[کنایی]* ئەرکی سەرشان؛ کاری ناچار؛ چاری ناچار؛ کارێ کە بە ئەستۆی کەسێکەوە بێ.
**آش گِل گیوە:** *[کنایی]* تەڕەقووڕکە؛ تەڕەماش؛ چێشتی بێتام و قیزەون.
**آش ماست:** ئاش‌ماس؛ ماسەوا؛ چێشتێ کە دوای لێنانی، ماستیشی تێدەکەن.
**آش نذری:** ئاشێ‌کە بە مەبەستی بە جێ هاتنی نزا و پاڕانەوەیەک لێیدەنێن.
**آش همان آش و کاسە همان کاسە:** هەر هەرەکە و هەر بارەکە؛ دیسان ئەو سڕنا و پیکە/ دیسان ئەو فاک و فیکە؛ هەر ئەو خەرمانە و هەر ئەو گێرەیە؛ هەر وەکوو خۆی مانەوە و هیچ نەگۆڕانی بار و دۆخی نالەباری شتێ ‹مژده بده ای صبا به مردم اوباش/ کاسە همان کاسە است و آش همان آش: ئەمسالیش هەر وەک پارەکە/ هەر هەرەکە و هەر بارەکە›.
▣ **آش برای کسی پختن:** *[مجازی]* پیلان نانەوە بۆ کەسێک؛ هەرە پەی پۆی گێرتەیوە ‹معلوم شد خوب آشی برایش پختەاند: دەرکەوت پیلانیکی باشیان بو ناوەتەوە›.
**آش بە دهن داشتن:** *[کنایی]* دەم بە یەکدا هاتن؛ قسەکردنی وا کە کەسی لێ تێنەگا ‹مگر آش بە دهن داشتی؟ می‌خواستی درست حرف بزنی: بۆ دەمت بە یەکدا دەهات؟ با جوان قسەت بکردایە›.
**آش درکاسەی کسی ریختن:** *[کنایی]* ئاوکردنە ئاشی کەسێکەوە؛ خێر بە کەسێ گەیاندن؛ بە کەسێ قازانج گەیاندن.
**آش را خوردن وکاسەاش/ جایش را شکستن:** *[مجازی]* ئاو خواردن و گۆزە شکاندن؛ نان خواردن و سفرە دڕین؛ چەمەنە ئاوی واردەی و تەوەنیش وسەینە ‹از آنهاست کە آش را می‌خورند و کاسەاش را می‌شکنند: لەوانەیە وا ئاو دەخواتەوە و گۆزە دەشکێنێ›.
**آش نخوردن و دهن سوختن:** *[مجازی]* ماچی نەکریا و زەنگی زریا؛ بە بێ تاوان، جزیا دیتن؛ نەواردەی و سۆتەی ‹پول را او برد و مرا دستگیر کردند، شدم آش نخوردە و دهن سوختە: پارەکە ئەو بردی و منیان قۆڵبەس کرد، ماچی نەکریا و زەنگی زریا خۆم›.
**ــ آشام** / 'āšām/ ،ان/: *پیوازە.* ـمژ؛ ـخۆرەوە؛ ـڤەخۆر؛ ـئاشام؛ ـهۆرلووش؛ کەسێ کە دەنۆشێ ‹خون‌آشام: خوێنمژ›.
**آشامیدن**/ 'āšāmîdan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**آشامیدی:** نۆشیت؛ **می‌آشامی:** دەنۆشی؛ **بیاشام:** بنۆشە// نۆشین؛ ئاشمای؛ ڤەخوارن؛ خواردنەوە؛ فڕکردن؛ ورماشین؛ وەخواران؛ هەڵقۆڕان؛ هۆرلووشەی؛ هۆرقۆڕنەی؛ نانە

سەرەوەی شتی ئاوەکی ‹آب آشامیدن: ئاو نوشین›.

■ صفت فاعلی: **آشامنده** (نۆشەر)/ صفت مفعولی: **آشامیده** (نۆشراو)/ مصدر منفی: **نَیاشامیدن** (نەنۆشین)

**آشامیدنی** / āšāmîdanî'، ـها/:/اسم. خواردنەوە؛ خواردنەوەیی.

**آشانتی** / āšāntî'/:/اسم. ئاشانتی: ١. خێڵی ڕەش پێستی سەربە غەنا لە ئەفریقادا ٢. /ـها/ هەرکام لەو خەڵکە ٣. زمانی ئەو خەڵکە، لە بنزاراوەگەلی ئاکان.

**آشپز** / āšpaz'، ـها/:/اسم. چێشتلێنەر؛ ئاشپەز؛ ئازپیش؛ شێوکەر؛ چێشتکەر؛ زادچێکەر؛ ئاشچی: ١. کەسێ کە کاری چێشت لێنان بۆ کەسانی دیکەیە (بۆ وێنە لە نەخۆشخانە، میوانخانە و سەربازخانەدا) ٢. کەسێ کە لە چێشت لێنان و ئاشپەزیدا کارامەیە.

**آشپزخانه** / āšpazxāne'، ـها/:/اسم. ئاشپەزخانە؛ کارخانە؛ هێشخانە؛ چێشتخانە؛ جێگەی چێشت لێنان ‹خانه بد نبود، ولی آشپزخانه‌اش خیلی کوچک و تاریک بود: ماڵەکە خراپ نەبوو، بەڵام ئاشپەزخانەکەی زۆر چکۆلە و تاریک بوو›.

▣ **آشپزخانه‌ی اُپن**: ئاشپەزخانەی باز؛ شێوازێکی نوێ ئاشپەزخانەی ماڵانە کە لە بەرێک یان دوو بەرەوە دیواری بۆ نانێن.

**آشپزی** / āšpazî'/:/اسم. ئاشپەزی؛ چێشتکەری؛ شیولێنەری: ١. کار یان ڕەوتی چێشت لێنان ٢. هونەری سەبارەت بە چۆنیەتی شیو لێنان ‹دخترم به کلاس آشپزی می‌رود: کچەکەم دەڕواتە کەلاسی ئاشپەزی› ٣. پیشەی ئاشپەز.

**آشتی** / āštî'، ـها/:/اسم. ئاشتی: ١. تەبایی؛ تەڤایی؛ سازشت؛ هێمنایەتی؛ هاش؛ کار یان ڕەوتی دەسهەڵگرتن لە شەڕ و دوژمنایەتی یان ناتەبایی ٢. */ادبی/* ئارا و قارا؛ هەڤان؛ ئارامشت و نێوانخۆشی.

▣ **آشتی دادن**: ئاشت دانەوە؛ پێک ئانین؛ پێکهانین؛ لێک ئانین؛ ڕێک خستن؛ ئاشتکەردەیوە؛ ئاشتکردنەوەی دوو نەیار ‹می‌خواهم تو را با پدرت آشتی بدهم: دەمەوێ لەگەڵ بابت ئاشتت بدەمەوە›.

**آشتی کردن**: ئاشت بوونەوە؛ ئاشتی کردن؛ خۆش بوونەوە؛ سازان؛ هۆڕێ ئاردەنە؛ وەرەی ئامایش؛ دڵەوە داین؛ دووس کردن ‹با پدرم آشتی کردم: لەگەڵ باوکم ئاشت بوومەوە›.

**آشتی‌پذیر** / āštîpazîr'/: صفت. */ادبی/* ئاشتیخواز؛ ئاشتیواز؛ تەبا ویست؛ بە توانا و ئامادە بۆ ئاشتکردنەوە ‹مرد آشتی‌پذیری است: پیاوێکی ئاشتیخوازە›.

**آشتی‌جویانه**[1] / āštîcûyāne'/: صفت. ئاشتیخوازانە؛ خاوەن هۆگری بە ئاشت کردنەوە ‹رفتار آشتی‌جویانه: ئاکاری ئاشتیخوازانە›.

**آشتی‌جویانه**[2]: قید. ئاشتیخوازانە؛ خاوەن هۆگری بە ئاشتکردنەوە ‹آشتی‌جویانه پیش آمد: ئاشتیخوازانە هاتە پێشەوە›.

**آشتی‌کنان** / āštîkonān'/:/اسم. ئاشتبوونەوە؛ ڕێوڕەسمی ئاشتبوونەوە ‹برای آشتی‌کنان سارا و شوهرش مهمانی داده بودند: بۆ ئاشتبوونەوەی سارا و شووەکەی میوانییان دابوو›.

**آشخوری** / āšxorî'/: صفت. ئاشخۆری؛ ئاشوەری؛ چێشتخۆری؛ تایبەت بۆ خواردنی ئاش ‹بادیه‌ی آشخوری را گذاشت وسط سفره: بایەی ئاشخۆریەکەی نا ناوەڕاستی سفرەکەوە›.

**آشغال** / āšqāl'، ـها/:/اسم. */گفتاری/* زبڵ؛

زبیل؛ زوێل؛ زبڵ و زاڵ؛ گوهوور؛ گلێش؛ شەخەڵ؛ گەناڵ؛ گەناڵخە؛ گناڵخە؛ گەنەڵخە.

**آشغال‌برچین** / āšqālbarčîn/' ☜ **آشغال‌جمعکن-۱**

**آشغال‌جمعکن** / āsqālcam'kon/'، ـها/: [فارسی/ عربی/ فارسی]/*اسم*. ۱. زبڵ گەڕ؛ کەسێ کە بە ناو زبڵ و زاڵدا دەگەڕێ و شتێ کە بە کاری بێت کۆی دەکاتەوە و دەیفرۆشێ ‹چند آشغال‌جمعکن افتاند بە جان زبالەها و آنها را کاویدند: چەن زبڵ‌گەڕ کەوتنە ناو زبڵەکانەوە و ژێر و بانیان دەکرد›: **آشغال‌برچین؛ آشغال‌ورچین** *[گفتاری]* ۲. *[مجازی]* گەنەکۆ؛ کەسێ کە ئامرازی کۆن و لەکارکەوتوو و بێ قازانج کۆ دەکاتەوە و هەڵیان‌دەگرێ ‹تو اصلاً آشغال‌جمعکنی و دوست داری این چیزهای بدرد نخور را جمع کنی: تۆ هەر گەنەکۆی و حەزت لە کۆکردنەوەی ئەم شتە پووچانەیە›.

**آشغالدان** / āšqāldān/'، ـها/: *اسم. [گفتاری]* زبڵدان؛ سەبرگە؛ سەرانگوێلک؛ تەبغە؛ شەخەڵگا؛ بووڵگا؛ لاسکدان.

**آشغالدانی** / āšqāldānî/'، ـها/: *اسم. [گفتاری]* زبڵدانی؛ شەخەڵدانی؛ بووڵدانی؛ گڵدال؛ گەناڵدان.

**آشغال‌گوشت** / āšqālgûšt/'، ـها/: *اسم.* چەق؛ چەقە گۆشت؛ ئەو بەشانە لە گۆشت کە بە کەڵکی خواردن نەیێن ‹این آشغال‌گوشتها را ببر بریز جلوی گربە: ئەم چەقە گۆشتانە ببە بیخەرە بەر پشیلەکەوە›.

**آشغال‌ورچین** / āšqālvarčîn/' ☜ **آشغال‌جمعکن-۱**

**آشغالی** / āšqālî/'، ـها/: *اسم. [گفتاری]* پاکەوان؛ زبیل‌ڕێژ؛ زبڵماڵ؛ سەبرگەچی؛ سپوور؛ سبوور؛ سفوور؛ گەسکدەری کۆڵان.

**آشفتگی** / āšoftegî/'، ـها/: *اسم.* ۱. شێواوی؛ شپرزەیی؛ پرژ و بڵاوی؛ بێ‌سەروبەری؛ پەرێشانی؛ شڵەژاوی؛ تێکەڵ‌ـپێکەڵی؛ تەڤلهەڤی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی شێوان ‹استاد از اشفتگی کارها شکایت داشت: مامۆستا لە شڵەژاوی کارەکان گازندەی بوو› ۲. تێکچوویی؛ گرژی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی توورە و ڕکهەستاو بوون ‹با اشفتگی جوابم را داد: بە تێکچوویی پەرسڤی دامەوە›.

**آشفتن** / āšoftan/': *مصدر. لازم. متعدی. [ادبی]* //**آشفتی**: شێوای؛ **می آشوبی**: دەشێوی؛ **بیاشوب**: بشێوە// □*لازم.* ۱. شێوان؛ پەرێشان بوون؛ شڵەژان؛ تێکچوون؛ ژلیوان؛ پەشۆکان؛ شیویەی؛ پەشۆکیەی ‹از این حرفها می‌اشفت: لەم قسانە هەڵدەشێوا› ۲. شێوان؛ تێکچوون؛ ڕاتڵەکان؛ لەدەسدانی ئارامشت ‹دریا اشفت: زەریا شێوا› □ *متعدی.* ۳. پەرێشان‌کردن؛ شێواندن؛ شێونەی؛ هەڵشێواندن؛ تێکدان ‹با این کارها مردم را می‌اشوبی: بەم کارانە خەڵکی پەرێشان دەکەی›. هەروەها: **آشفتنی**

■ صفت فاعلی: **آشوبنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **آشفته** (شێواو)/ مصدر منفی: **نیاشفتن** (نەشێوان)

**آشفته**/ āšofte/': *صفت.* شێواو؛ ئالۆز؛ شوسە؛ هەڵشێواو؛ شێویاگ؛ شێویاو؛ شێویا؛ شیڤیاگ؛ پەشۆکاو؛ شڵەژاو؛ شەمزاو؛ پەشێو؛ پەشۆکیا؛ چەواشە؛ تێکچوو؛ ژەلمسە؛ منتەوەش؛ گژۆلە؛ بێ سەرە و بەرە ‹موی آشفته: مووی شێواو؛ خواب آشفته: خەوی ئالۆز›. هەروەها: **آشفته بودن؛ آشفته شدن؛ آشفته کردن**

**آشفته‌بازار**/ āšoftebāzār/'، ـها/: *اسم. [کنایی]* ۱. قەرەباڵغ؛ گوڕمۆڕە؛ ئاخۆران‌ـباخۆران؛ گەرمۆڵ؛ تێکەڵ‌ـپێکەڵی؛ جێگەی شلووق

و شلەژاو ‹شهرهای بزرگ به صورت آشفته‌بازاری درآمده‌اند و زندگی در آنها دشوار است: شارەگەورەکان بوونەتە قەرەباڵغێکی وا کە ژیان تێیاندا زۆر دژوارە› ٢. دۆخی نەبوونی سەروبەر؛ کەس لە کەسی ‹در این آشفته‌بازار نمی‌دانی کی به خانه‌ات می‌رسی: لەم کەس‌لەکەسیەدا نازانی کەی دەگەیە ماڵەوە›.

**آشفته‌حال** / āšoftehāl'، ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت. [ادبی]* شپرزە؛ شلەژاو؛ شێواو؛ پەشێوحاڵ ‹پارسال دیدمش خیلی آشفته‌حال بود: پارەکە چاوم پێکەوت، زۆر شپرزە بوو›.

**آشفته‌خاطر** / āšoftexāter'، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت. [ادبی]* دڵ پەرێشان؛ دڵ پەشۆکاو؛ دڵ پەشێو؛ دڵ پەرت؛ خەیاڵ بڵاو؛ ناخاترجەم ‹به خاطر دخترش آشفته‌خاطر بود: بەبۆنەی کچەکەیەوە دڵ پەریشان بوو›: **آشفته‌دل**

**آشفته‌دل** / āšoftedel'/ ☜ **آشفته‌خاطر**

**آشفته‌کار** / āšoftekār'، ـان/: *صفت. [ادبی]* شپرزەکار؛ شپرز؛ هەرەمەگوڵخار ‹خیلی آشفته‌کار است: زۆر شپرزەکارە›.

**آشفته‌کاری** / āšoftekārî'، ـها/: *اسم.* شپرزەکاری؛ شپرزی؛ هەرمەگوڵخاری؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی بێ سەر و بەرە بوون لە کاردا ‹در اداره کم‌کاری و آشفته‌کاری می‌بینیم: لە مەزرینگەدا کەمتەرخەمی و شپرزەکاری دەبینین›.

**آشفته‌مو** / āšoftemû'، ـیان/: *صفت. [ادبی]* دژیا؛ قژنەسەرە؛ گژنەسەرە؛ سەرقژن؛ قژئاڵۆز؛ سەرەدژیا؛ قژەگژە؛ مووگرژ؛ خاوەن مووی سەری شێواو و تێکەڵ‌ـپێکەڵ.

**آشفته‌هوش** / āšoftehûš'/: *صفت. [ادبی]* بیربڵاو؛ بیرشاش؛ بێ‌بیر و هۆش؛ فرامۆشکار؛ ویرشێویا.

**آش‌کار** / āš.kār'، ـها؛ ـان/: *اسم.* ئاش‌کار: ١. شۆکار؛ ئەو کەسەی کە جل‌وبەرگ هەنگووژاو (ئاهار) دەدات ٢. هەڵاڵکار؛ پێستە خۆشکەر * **آشگر؛ آشمال**

**آشکار** / āškār'/: *صفت.* دیار؛ ئاشکرا؛ ئەشکەر: ١. هاینە؛ بەرچاو؛ وەرەچەم؛ ڕاشکاو؛ بان‌واز؛ واز؛ ناوخەت؛ خۆیا؛ خوانە؛ خوانی ‹نشانه‌های آشکار: نیشانەگەلی ئاشکرا› ٢. ڕوون؛ زانراو و ناسراو ‹منظور حرفهایش برایم آشکار بود: مەبەستی قسەکانی بۆم ئاشکرا بوو›. هەروەها: **آشکار بودن؛ آشکار شدن؛ آشکار کردن؛ آشکار گشتن**

**آشکارا**[1] / āškārā'/: *صفت. [ادبی]* دیار؛ ئاشکرا؛ ئەشکەرە؛ ڕاشکاو.

**آشکارا**[2]: *قید.* بە ڕاشکاوی؛ بە ئاشکرایی؛ ئاشکرا؛ سوورەسوور؛ زەق؛ لە بەر چاو ‹آشکارا دروغ می‌گفت و خجالت هم نمی‌کشید: بە ڕاشکاوی درۆی دەدا و شەرمیشی نەدەکرد›.

**آشکارساز** / āškārsāz'، ـها/: *اسم.* خۆیاکەر؛ کەرەسە یان دەزگایەک بۆ دەرخستنی هەبوونی شتێ: **آشکارگر**

**آشکارگر** / āškārgar'/ ☜ **آشکارساز**

**آش‌کاری** / āš.kārî'/: *اسم.* ئاش‌کاری؛ شۆکاری؛ هەڵاڵکاری؛ کار یان پیشەی ئاش‌کار: **آشگری؛ آشمالی**

**آشکاری** / āškārî'/: *اسم.* ئاشکرایی؛ ئاشکاری؛ دیاری؛ لەبەر چاوی؛ ڕاشکاوی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی ئاشکرا بوون.

**آشگر** / āš.gar'/ ☜ **آش‌کار**

**آشگری** / āš.garî'/ ☜ **آش‌کاری**

**آشمال**[1] / āš.māl'/ ☜ **آش‌کار**

**آشمال**[2]: *صفت. [مجازی]* ماستاوکەر؛ پیاز پاک‌کەر؛ دالانەماڵ؛ زمان‌لووس.

**آشمالی** / āš.mālî'/: *اسم.* ١. ئاش‌کاری؛ ئاش‌ساوین ٢. *[مجازی]* ماستاوکەری؛ زمان‌لووسی.

**آشنا**[1] / āš(e)nā'، ـها؛ ـیان/:/اسم. ئاشنا: ١. ناس؛ ناسکری؛ شناس؛ ناسیاو؛ نیاس؛ گولساخ؛ هاونشین و هاوقسەیەک کە زۆر نێزیک نەبێ ‹در آن اداره دو سه نفر آشنا داشتم: لەو مەزرینگەیەدا دووــ سێ ئاشنام هەبوو› ٢. شناس؛ خزمی دوور ‹از آشناهای شوهرم است: لە ئاشناگەلی شووەکەمە› ٣. [ادبی] دۆس؛ هەڤال؛ دۆست و یاوەر؛ کەس و کار.

**آشنا**[2]: صفت. ئاشنا: ١. ناسیاو؛ ناسراو؛ ناس؛ ئەژناس. بەرانبەر: **ناشناس** ‹نه اسمش برایم آشنا بود نه قیافەاش: نە ناوی بۆم ئاشنا بوو نە دیمانی› ٢. خاوەن ئاشنایەتی ‹من با این پسکوچەها آشنا هستم: من لەگەڵ ئەم کووچە و کۆڵانانەدا ئاشنام› ٣. کەم ئاگادار ‹عربی و انگلیسی را خوب می‌داند و با آلمانی هم آشناست: عەرەبی و ئینگلیزی چاک دەزانێ و لەگەڵ ئاڵمانیشدا ئاشنایە›.

**آشنائی** / 'āš(e)nā'î/ ☜ **آشنایی**

**آشنایی** / āš(e)nāyî'، ـها/:/اسم. ئاشنایی؛ ئاشنایەتی: ١. ناسیاوی؛ ناسیاگی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی ئاشنا بوون ‹آشنایی آنها مربوط به سالها پیش بود: ئاشنایەتیان دەگەڕاوە بۆ لە مێژ ساڵ لەوە پێش› ٢. شناسایی؛ شوناسایی ‹آشنایی با کار آن ماشین، چندان هم ساده نیست: ئاشنایەتی لەگەڵ کاری ئەو ماشێنەدا، ئەوندەش هاسان نیە› ٣. ناسیاوی؛ نێوان خۆشی ‹آشنایی شما دو نفر برایم عجیب است: ئاشنایەتی ئێوە دوانەم زۆر پێ سەیرە›

*آشنائی

▣ **آشنایی دادن:** خۆ ناساندن؛ ئاشنایی خۆ لەگەڵ کەسێکدا دەربڕین ‹وقتی آشنایی داد، او را شناختم: کاتێ خۆی ناساند، ناسیمەوە›.

**آشوب** / āšûb'، ـها/:/اسم. ئاژاوە؛ بشێوی؛ پشێوی؛ بشێوە؛ کەتن؛ خارۆرە؛ ئاشۆ؛ شلۆقی؛ ئالۆزی؛ کێشە و هەرا؛ ئاژاولە؛ ئاژاولێ؛ ئاشوو؛ کەس‌لەکەسی؛ زەنا ــ زەنا؛ خڕین؛ خوارەبڕێ؛ هێو؛ گۆتاوەڕۆ؛ گۆتاڵ؛ گۆبەند؛ ئاشێو؛ گاشە؛ هەرا؛ دونیای بێ‌قانوون و کەس‌لەکەس. هەروەها: **آشوب‌شدن؛ آشوب‌کردن**

▣ **آشوب شدن دل:** دڵ بەیەکا هاتن؛ دڵ هەڵشێوان؛ دڵ هەڵشێویان؛ دڵ هۆرشلێویەی؛ دڵ تێکچوون ‹از دیدن آن منظره دلم آشوب شد: لە دیتنی ئەو دیمەنە دلم هەلشیوا›.

**آشوباندن** / āšûbāndan'/: مصدر. متعدی. [ادبی] //**آشوباندی:** شێواندت؛ **می‌آشوبانی:** دەشێوێنی؛ **بیاشوبان:** بشێوێنە// شێواندن؛ شلەژاندن؛ شێونەی؛ شێونای؛ هەڵشێواندن ‹مردم را آشوباندن: خەڵک هەلشیواندن›. هەروەها: **آشوباندنی**

■ صفت فاعلی: **آشوباننده** (هەڵشێوێنەر)/ صفت مفعولی: **آشوبانده** (هەڵشێوێنراو)/ مصدر منفی: [نامتداول] **نَیاشوباندن** (هەڵنەشێواندن)

**آشوب‌طلب** / āšûbtalab'، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. بشێوەخواز؛ ئاژاوەخواز؛ ئاشۆ هۆرگرن؛ هۆگری بشێوە و بەدیهاتنی ئاژاوە ‹گروه آشوب‌طلب: دەستەی بشیوەخواز›: **آشوبگرا**

**آشوب‌طلبانه** / āšûbtalabāne'/: [فارسی/ عربی] صفت. بشێوەخوازانە؛ پەیوەندیدار یان سەر بە بشێوەخوازی ‹فعالیتهای آشوب‌طلبانە: کارگەلی بشیوەخوازانە›.

**آشوبگر** / āšûbgar'، ـها؛ ـان/: صفت. ئاژاوەچی؛ گۆبەندگێڕ؛ کەتن‌گێڕ؛ خومەشێنکە؛ خومەشێونە؛ ئاشۆکەر؛ گۆتاڵکار؛ ئاشۆوەکەر؛ خەم‌شێوێن؛ تێکدەر؛ سەرسۆدەرە؛ شەڕهەلایسێن؛ شەڕهەڵخرێن؛ هێوچی؛ گولکە؛ شێوەژنە؛

بشوونە؛ بشێونە؛ گێرەشێوێن؛ چوولەی ئاشوو؛ خاوەن خوو و هۆگری بشێوەخوازی ‹افراد آشوبگر: کەسانی ئاژاوەچی›.

**آشوبگرا** / 'āšûbgerā/ ☜ **آشوب‌طلب**

**آشوبگرانە** / 'āšûbgarāne/: *صفت.* بشێوەخوازانە؛ ئاشۆکەرانە؛ پەیوەندیدار یان سەر بە بشێوەخوازی.

**آشوبگری** / 'āšûbgarî/، ـها/: *اسم.* ئاژاوەچیەتی؛ کەتن‌گێری؛ هەڵشاندنەوە؛ ئاشۆکەری؛ ئاشۆ هۆرگرنی؛ شێوەژنی؛ گێرە شێوێنی؛ کار یان ڕەوتی بشێوە نانەوە؛ بەدیهێنانی بشێوە ‹دستەهای اوباش بە آشوبگری می‌پرداختند: لات‌ولووتگەل خەریکی بشێوە نانەوە بوون›.

**آشوبیدن** / 'āšûbîdan/: *مصدر. لازم. متعدی.* *[ادبی]* //**آشوبیدی**: شڵەژای؛ **می‌آشوبی**: دەشڵەژێی؛ **بیاشوب**: بشڵەژە// ☐*لازم.* ۱. شێوان؛ شێویان؛ شێویەی؛ شێویای؛ تووشی پشێوە هاتن ‹همە جا آشوبید: هەموو لایەک شڵەژا› ۲. شپرزە بوون؛ ئاڵۆز بوون؛ پەشۆکان؛ شڵێویەی؛ پەرێشان بوون ☐ *متعدی.* ۳. شێواندن؛ هەڵشێواندن؛ شێونەی؛ ئاڵۆزهکاندن؛ دانەیەکا ‹شهرها را آشوبیدند: شارەکانیان شیواند›. هەروەها: **آشوبیدنی**

■ صفت فاعلی: **آشوبندە** (ـ)/ صفت مفعولی: **آشوبیدە** (شڵەژاو)/ مصدر منفی: **نیاشوبیدن** (نەشڵەژان)

**آشوری** [۱] / 'āšûrî/: *اسم.* ئاشووری؛ ئاشۆری؛ مەخین: ۱. /ـها؛ ـان/ ئاسووری؛ هۆزی سامی خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە پێشتر «سوریانی»یان پێ دەگوتن و ئێستەش لە ئێران، ئیراق، تورکیە، لوبنان، سووریە و ئامریکادا بڵاون ۲. /ـها؛ ـان/ هەرکام لە خەڵکانی هۆزی سامی نیشتەجێی ولاتانی کەونارای ئاشوور لە ناوچەی بەین‌چۆمان ۳. زمان یان شێوەی نووسینی ئەو هۆزە.

**آشوری** [۲]: *صفت.* ئاشووری؛ هاوگەر یان پاڵدراو بە ولاتی کەونارای ئاشوورەوە.

**آش‌ولاش** / 'āš-o-lāš/: *صفت. [گفتاری]* شەل‌وپەل؛ لەت‌وپەت؛ شەل‌وپەت؛ شڕ و وڕ؛ شی‌وشیتاڵ ‹صورت جوان بیچارە آش‌ولاش شدە بود: ڕوومەتی ئەو لاوە داماوە شەل و پەت بوو›. هەروەها: **آش‌ولاش شدن؛ آش‌ولاش کردن**

**آشیان** / 'āš(i)yān/، ـها/: *اسم. [ادبی]* ☜ **آشیانە**

**آشیانە** / 'āšiyāne/، ـها/: *اسم.* ۱. هێلانە؛ هێلین؛ هێلان؛ هێلیوون؛ هالەین؛ هیلیان؛ لیانە؛ لیان؛ ئیلیان؛ لانە؛ لوونە؛ کاپۆ؛ واجا؛ قن؛ قنک؛ ماڵی مەل ‹لکلکی از آشیانەاش بیرون پرید: حاجی‌لەق‌لەقێک لە هێلانەکەیەوە دەرپەڕی› ۲. *[مجازی]* خانوو؛ یانە؛ ماڵ ‹هر کس نیاز بە آشیانەای دارد: هەر کەسێ پێویستی بە خانوویەک هەیە›✻ **آشیان** *[ادبی]*

⊡ **آشیانە ساختن**: ۱. هێلانە دروست‌کردن؛ لانە درووس‌کردن؛ لانەکردن؛ لیان وەش‌کەردەی ۲. خانوو دروست‌کردن؛ ماڵ‌کردنەوە؛ یانەوەکەردەی.

**آشیانە کردن**: هێلانە بەستن؛ هێلانە کردن؛ نیشتەجێ بوون؛ جێ‌خۆش‌کردن؛ لیان وەش‌کەردەی؛ هیلیان بینەی؛ جێگر بوون ‹کبوتران در آن خانە آشیانە کردند: کۆترەکان لەو ماڵە هێلانەیان کردەوە›: **آشیانە گرفتن**

**آشیانەی کسی را برهم زدن**: *[مجازی]* ماڵی کەسێک وێران‌کردن؛ ماڵ کەسێ شێواندن؛ یانەو یۆی شێونەی؛ بوونە هۆی شێواندنی بنەماڵەی کەسێک ‹شوهرش را اخراج کردند و آشیانەاش را بر هم زدند: شووەکەیان دەرکرد و ماڵ‌وێرانیان کرد›.

**آشیانه گرفتن** ☜ **آشیانه کردن**

**آشیانه‌دوست** / āš(i)yānedûst'، ـان/: *صفت. [زیست‌شناسی]* هێلانه‌دۆست؛ هێلان‌ویست؛ هێلانه‌خواز؛ خاوەن تایبەتمەندی جێگربوون و مانەوە لە هێلانەوە تا کاتی فڕان (سەبارەت بە پەلەوەری پێنەگەیشتوو).

**آشیانه‌گریز** / āš(i)yānegorîz'، ـان/: *صفت. [زیست‌شناسی]* خاوەن تایبەتمەندی بە جێهێشتنی هێلانە بە دوای لە هێلکە جووقان (سەبارەت بە پەلەوەری پێگەیشتوو).

**آغا** / āqā'/: [مغولی] *اسم. [قدیمی]* ١. خاتوو؛ خاتوون؛ خا؛ خان؛ نازناوی ژنان لە سەرەتا یان لە کۆتایی ناویاندا ‹ملک‌تاج آغا: خاتوو مەلەک‌تاج› ٢. خەساو؛ خەسیاگ؛ نازناوێک بۆ پیاوانی خەسێنراو.

**آغار** / āqār'/: *اسم. [نامتداول]* ١. شێ؛ شۆ؛ نمیای؛ نم؛ شە؛ شۆیەک کە دادەچێ و شوێنی دەمێنێتەوە ٢. نمتک؛ نز؛ زنە؛ تەڕایی؛ ئاودزە؛ تاچنە؛ ئەوەی لە گۆزەوە دەدەڵێ.

**آغاردن** / āqārdan'/: *مصدر. متعدی. لازم. [نامتداول]* □ *متعدی.* ١. شێ‌دان؛ شێ‌هەڵدان؛ شێ هەڵاوردن؛ نماندن ٢. ئاو پاشین؛ ئاو پژاندن؛ ئاوپژگنەی ٣. خووساندن؛ فیسنەی؛ فیسنای □*لازم.* ٤. شێ گرتن؛ شۆ هاوردن؛ نم‌کێشتەی ٥. خووسان؛ فیسیەی؛ تەڕ بوون: **آغاریدن؛ آغردن**. هەروەها: **آغاردنی**

■ صفت فاعلی: **آغارنده** (خووسێنەر)/ صفت مفعولی: **آغارده** (خووسێنراو)

**آغاره** / āqāre'، ـها/: *اسم.* نەوارێکی (زۆرتر) چەرمی کە بە مەبەستی بەرگیری لە ئاودزینەوە، دەپەڕانپەڕی ناوەوەی کەوشی دەنێن.

**آغاریدن** / āqārîdan'/ ☜ **آغاردن**

**آغاز** / āqāz'/: *اسم. [ادبی]* سەرەتا؛ دەسپێک؛ کەبارە؛ پیت: ١. بەشی یەکەمی هەرشتێ ‹آغاز کتاب؛ آغاز تابستان: سەرەتای کتێب؛ سەرەتای هاوین› ٢. هەوەڵین قۆناغی هەر کارێ. بەرانبەر: **انجام** ‹آغاز جنگ؛ آغاز آشنایی: سەرەتای شەڕ؛ سەرەتای ئاشنایی›.

⊡ **آغاز شدن**: دەسپێکردن؛ دەس‌پنە کەردەی؛ وەدی هاتنی کار یان ڕووداوێک ‹کار آغاز شد؛ زمستان اغاز می‌شود: کارەکە دەستی پێکرد؛ زستان دەسپێدەکات›.

**آغاز کردن**: دەسپێکردن؛ دەس‌پنە کەردەی؛ خەریک کارێ بوون؛ بەدیهێنانی شتێ یان کارێ ‹نوشتن کتاب را آغاز کرد: نووسینی کتێبەکەی دەسپێکرد›.

**آغازگر** / āqāzgar'، ـها؛ ـان/: *اسم.* ١. ڕچەشکێن؛ ڕێخۆشکەر؛ ناسێنەری کارێکی نەکراو کە لە دواییدا درێژەی پێ بدرێ و گرینگ بێتەوە ٢. دەسپێکەر؛ کەسێ کە لە سەرەتاوە کارێک دەست بۆ دەبا ٣. *[ورزش]* دەسپێکەر؛ بەرپرسی کێبەرکێی غارغارێن (ئەسب‌دەوانی).

**آغازگری** / āqāzgarî'/: *اسم. [ادبی]* دەسپێکەری؛ ڕچەشکێنی؛ ڕێخۆشکەری؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی دەسپێکەر بوون.

**آغازی** / āqāzî'، ـان/: *صفت.* سەرەتایی؛ پیتی؛ کەبارەیی؛ پەیوەندیدار یان پاڵدراو بە سەرەتاوە.

**آغازیدن** / āqāzîdan'/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**آغازیدی**: دەستت‌پێکرد؛ **می‌آغازی**: دەست‌پێدەکەی؛ **بیاغاز**: دەست‌پێبکە// دەسپێکردن؛ دەس‌پنەکەردەی؛ خەریکی ئەنجامی کارێ بوون هەر لە قۆناغی سەرەتاییەوە. هەروەها: **آغازیدنی**

■ صفت فاعلی: **آغازنده** (دەسپێکەر)/ صفت مفعولی: **آغازیده** (دەسپێکراو)/ مصدر منفی: **نَیاغازیدن** (دەسپێنەکردن)

**آغازین** / āqāzîn'/: *صفت. [ادبی]* سەرەتایی؛ هەوەڵی؛ ئێکەمی ‹مرحلەی آغازین: قۆناغی سەرەتایی›.

**آغالش** / āqāleš'، ـها/: *اسم. [ادبی]* ١. زیخان؛ دنە؛ هەڵخران؛ بزوان ٢. راپەرین؛ شۆرش؛ ورووژان؛ هورووژان.

**آغالیدن** / āqālîdan'/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* ١. زیخاندن؛ دنەدان؛ هاندان؛ هەڵخراندن؛ هەڵنان؛ بزواندن؛ هۆرخرنەی؛ هۆرنیەی؛ هۆرنیای ٢. راپەراندن؛ ورووژاندن؛ هورووژاندن.

■ صفت فاعلی: **آغالنده** (هەڵخرێنەر)/ صفت مفعولی: **آغالیده** (هەڵخرێنراو)

**آغر** / āqar'/: *اسم.* مەرخاو؛ هەشکەرۆ؛ گۆمەلاو؛ چاڵ و چۆڵی ئاو گرتووی بەستۆرەی چۆم.

**آغردن** / āqardan'/ ☜ **آغاردن**

**آغز** / āqoz'/ ☜ **آغُوز**

**آغشتگی** / āqeštegî'، ـها/: *اسم.* شەلالی؛ تێوەدراوی؛ گەوزاوی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی شەلال بوون.

**آغشتن** / āqeštan'/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**آغشتی**: گەوزاندت؛ **آغشته می‌کنی**: دەگەوزێنی؛ **آغشته‌کن**: بگەوزێنە// ١. گەوزاندن؛ تێوەدان؛ پێوەدان؛ پلگانن؛ ئاڵشتەی؛ تێوەدانی شتێ لە تراوێک ‹کاغذ را به مرکب اغشتن: تێوەدانی قاقەز بە مرەکەفەوە› ٢. خووساندن؛ تێکەڵ کردن؛ ئاڵشتەی؛ شتێ لە گەڵ تراوێکدا تێکەڵ کردن ‹گچ را به آب آغشتن: گەچ لەناو ئاودا خووساندن›. هەروەها: **آغشتنی**

■ صفت مفعولی: **آغشته** (گەوزاو)/ مصدر منفی: **نَیاغشتن** (نەگەوزاندن)

**آغل** / āqol'، ـها/: *اسم.* هۆڵەمەڕ؛ هۆڵ؛ هۆڕ؛ هەڵ؛ گەوڕ؛ ئاخل؛ ئاغەڵ؛ غەڵ؛ ئەژیر؛ تەژیر؛ بنگوف؛ بنگوفک؛ گۆڤ؛ پاگە؛ لیت؛ پەچیە؛ کۆز؛ کۆزە؛ کۆزمانە؛ گەلەخان؛ شوێنی سەرداپۆشراو بو ڕاگرتنی مەڕ و ماڵات.

**آغوز** / āqoz'/: *اسم.* ژەک؛ ژاک؛ زاک؛ فرشک؛ فرچک؛ گووش؛ فرەندوول؛ شیرماک؛ فلە؛ شمە؛ فرشە؛ زهک؛ فری؛ فرۆ؛ خرندۆڵ؛ خەلەندۆز؛ قاقنە؛ خریشک؛ لێوە؛ لوی؛ زەها؛ گوچ؛ شیری زنج؛ شیری چەور و خەستی گوان/ مەمک، چەن ڕۆژ پێش یان پاش زایین: **آغُز**

**آغوش** / āqûš'، ـها/: *اسم.* باوەش؛ باوش؛ واشی: ١. کۆش؛ کەش؛ ئامێز؛ هامێز؛ هەمێز؛ هامبێز؛ هەمبێز؛ هەمبز؛ همێز؛ همبز؛ نێوان سینە و باسک ٢. *[مجازی]* داوێن؛ جێگای گرتنە بەر‹آغوش طبیعت: داوێنی سروشت›.

▣ **آغوش باز**: باوەشیئاوەلا ‹مردم از او با آغوش باز استقبال کردند: خەڵکی بە باوەشی ئاوەلاوە پێشوازییان لێکرد›.

**آغوش‌گرم**: ئامێزیگەرم؛ باوەشی پرسۆز ‹به آغوش‌گرم خانواده بازگشت: گەڕایەوە بۆ ناو ئامێزی گەرمی بنەماڵەکەی›.

▣ **آغوش‌گشودن**: ١. باوەش‌کردنەوە؛ باوش کردنەوە؛ واشی وازکەردەی؛ درێژ کردنەوەی دەست بۆ لە هامێزگرتن ٢. *[مجازی]* دەرگانەکردنەوە؛ وەرگیران؛ ڕووتێکردن.

**آغول** / āqûl'/: *اسم. [ادبی]* لاتیر؛ مۆڕ (بردنەوە)؛ چێر؛ چیر (بردنەوە)؛ دووپرەکی (کردنەوە)؛ تیکورک (کردنەوە): **آغیل**

**آغیل** / āqîl'/ ☜ **آغول**

**آفات** / āfāt'/: [عربی] جمعِ ☜ **آفت**

**آفـازی** / āfāzî'/: [فرانسوی] *اسم. [روانشناسی]* توری؛ تری؛ لاڵەپەتێ؛ گیر بوونی زمان لە قسەکردندا.

**آفـاق** / āfāq'/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. جمعِ ☜ **اُفُق** ۲. *[نامتداول]* ئاقار؛ هۆرە؛ دەوروبەر ۳. وڵاتان؛ ئاواق ‹سیرِ آفاق: گەشتی وڵاتان›.

**آفـاق‌وانفس** / āfāq-o-anfos'/: [عربی] *اسم.* وڵاتان و خەڵکان؛ وڵگان و خەڵکان.

**آفـاقی** / āfāqî'/: [عربی] *صفت.* ۱. ئاقاری؛ پەیوەندیدار بە ئاقارەوە ۲. *[فلسفه]* ڕواڵەتی؛ دەرەوەیی.

**آفـت** / āfat'، ـها؛ آفات/: [عربی] *اسم.* ۱. مـێمڵ؛ مەریفی؛ تەشە؛ ئافەت؛ ئافات؛ گرگاشە؛ ئاپۆر؛ بەلا؛ وەی ‹آفت آسمانی: مێمڵی ئاسمانی› ۲. نەخۆشی؛ درم؛ پەتا؛ ئازار ‹خداوند تو را از آفتها حفظ کند: خوا لە نەخۆشی بتپارێزێ› ۳. هال؛ ئازار؛ هۆی لە بەین چوون و خراپی.

⧈ **آفت آسمانی:** مێمڵی ئاسمانی؛ بەلای ئاسمانی؛ بەلاگەلێک کە ئەبێتە هۆی لە بەین‌چوونی دەسهاتی کشت‌وکاڵ و لە ناو بردنی گیانلەبەران (وەکوو تەرزە، گێژەڵووکە، کەم بارانی): **آفت سَماوی**

**آفت ارضی** ☜ **آفت زمینی**

**آفت انباری:** مێمڵی هەمار؛ مێمڵی هومار؛ شتێ (وەک مشک و جرجانەوەر) کە ئەبێتە هۆی گەزنگاز بوونی هەر شتێ کە هەمارکراوە.

**آفت زمینی:** مێمڵی زەمینی؛ شتێ (وەک کرم و بژار) کە لە ژێر زەمینەوە ئەبێتە هۆی لە بەین چوونی تۆوی چێندراو.

**آفت سَّماوی** ☜ **آفت آسمانی**

**آفت‌گیاهی/ نباتی:** مێمڵی شینایی؛ گیاڕەنج؛ یەختەسار؛ ئەوەی کە دەسهاتی کشت‌وکاڵ و باخات لە بەین دەبات (وەکوو کوللە).

**آفتـاب** / āftāb'/: *اسم.* هەتاو: ۱. هەتاف؛ هەفتاو؛ خۆرەتاو؛ خوەرەتاو؛ تیرۆژ؛ تیسک؛ ڕۆجیار؛ تیجیە؛ وەرەتاو؛ تیشکی خۆر؛ تیشکی ڕۆژێ ‹آفتاب دادن: دانەبەر هەتاو› ۲. *[مجازی]* خۆر؛ خوەر؛ وەر ڕۆژ؛ ڕۆج؛ ڕۆچ ۳. بەربەڕۆچکە؛ خۆرەتاو؛ خوەرەتاو؛ وەرەتاو؛ بەرەفتەو. بەرانبەر: **سایه** ‹اینجا آفتاب است، ببر سایه: ئێرە خۆرەتاوە، ببە سێبەرەوە›.

⧈ **آفتاب به آفتاب:** هەموو ڕۆژ؛ هەر ڕۆژە؛ ڕۆژ لە دووی ڕۆژ.

**آفتاب پاییزی:** *[کنایی]* زەردەی پاییزی؛ وەرە پەیزە؛ وەرە سەردا بەرە؛ خۆری ڕەقەو بردوو؛ خۆرەتاوی بێ‌تین و کەم ڕەنگ.

**آفتاب دولت:** *[کنایی]* چرای بەخت؛ هەڤیازی و بەهێزی.

**آفتاب لب‌بام:** *[کنایی]* خۆرەتاوی دەم پاسار؛ هەتاوی دەم‌کەل؛ پای لێو قەور؛ دەمینوو کەلی؛ لە کاتی مردن و لە بەین چوون ‹او دیگر آفتاب لب بام است و چیزی از عمرش باقی نمانده: ئەو ئیتر خورەتاوی دەم پاسارە و تەمەنی ئەوەندەی پێوە نەماوە›.

⧈ **آفتاب از مغرب طلوع کردن:** *[مجازی]* خۆر لە کام لاوە هەلاتن (لە کوردیدا هەمیشە بە شێوەی پرسیار دەگوترێ)؛ شتێکی سەیر و سەمەرە ڕوودان ‹چه عجب! مگر آفتاب از مغرب طلوع کرده است؟: سەیرە! ئەوە خور لە کام لاوە هەلاتووە؟›.

**آفتاب افتادن:** خۆرکەوتن؛ خۆرداکێشان؛ خۆرداکەوتن؛ خوەرکەفتن؛ وەرتاویایرە؛ وەرقاق بیەی؛ وەردایرە ‹آفتاب افتاده بود وسط اتاق: خور کەوتبووە ناوەڕاستی دیوەکەوە›.

**آفتاب بالا آمدن:** خۆر هەڵاتن؛ خۆر کەفتنە بان؛ ڕۆجیار هۆر وەسەی؛ وەر وەسەی سەر؛ خوەرەتاو هەڵکەفتن.

**آفتاب بە گل اندودن:** *[مجازی]* خۆر داپۆشان؛ پەل لە خۆرگرتن؛ تێکۆشانی بێئاکام بۆ داپۆشاندنی ڕاستی ‹این تلاشها همه آفتاب بە گل اندودن است: ئەم تێکۆشانە هەمووی خور داپۆشاندنە›.

**آفتاب پهن بودن/ شدن:** سێوەر درێژ بوون؛ سێبەر داکەوتن؛ سێبەر دابەزین؛ سێوەر هاتن؛ سێەی ئامایرە؛ سەی وەستەیرە؛ هێندێک لە ڕۆژ تێپەڕ بوون ‹آفتاب پهن بود کە راه افتادیم: کاتێ ڕێکەوتین سێبەر درێژ ببوو›.

**آفتاب جا کردن:** *[کنایی]* خۆ دانەخۆر؛ جێ خۆش کردن؛ لە بەر خۆرەتاوەوە دانیشتن ‹آفتاب جاکردە بود و تخمە می‌شکست: جێی خۆش کردبوو، تووی دەتووکاند›.

**آفتاب خوردن:** تاولێدان؛ تیشکی خۆر وێکەوتن؛ وەرەقاق دەیونە؛ لە بەر خۆرەتاودا بوون ‹بگذار کمی آفتاب بخورد، خشک شود: بیهێڵە کەمێ تاو لیی‌بدات، وشک ببێتەوە›.

**آفتاب دادن:** دانە خۆر؛ خوەردان؛ نیانە بەر خۆرەوە؛ لە بەر خۆرەتاو دانان؛ نیەی وەروو وەری ‹رختخوابها را آفتاب دادم: جێوبانەکەم خوردا›.

**آفتاب درآمدن:** ١. ☜ **آفتاب دمیدن** ٢. خۆر دەرکەوتن؛ خۆر دەرهاتن؛ وەرزیەی ‹آفتاب از پشت ابرها درآمد: خور لە پشت هەورەکانەوە دەرکەوت›.

**آفتاب در جایی غروب نکردن:** *[مجازی]* زۆر پان و بەرین بوون؛ ئاواق بوون؛ واق‌واق بوون ‹آفتاب در ملکش غروب نمی‌کند: ملکەکەی زۆر پان و بەرینە›.

**آفتاب دمیدن:** خۆر هەڵاتن؛ خۆر دەرهاتن؛ خۆرکەوتن؛ خوەر هەڵخستن؛ وەرزیەی؛ ڕۆجیار بەرئامەی ‹وقتی آفتاب دمید، همە بیدار بودیم: کاتێ کە خور هەڵات، هەموومان هەستابووین›: **آفتاب درآمدن؛ آفتاب زدن**

**آفتاب زدن:** *[گفتاری]* ١. ☜ **آفتاب دمیدن** ٢. خۆرلێدان؛ وەردەینە ‹آفتاب می‌زد توی چشمهایم: خور دەیدا بە ناو چاومدا›.

**آفتاب شدن:** خۆرکەوتنەوە؛ هەتاوکەوتن؛ خۆرکردنەوە؛ خۆر خستنەوە؛ خۆر هاتنەوە؛ خۆر دەرکەوتن؛ وەروسەیوە؛ دەرکەوتنی خۆر لە پشتی هەورەوە ‹صبح هوا ابری بود، بعدازظهر آفتاب شد: سەر لە بەیانی هەور بوو، پاش نیوەڕۆ خور کەوتەوە›.

**آفتاب کردن:** خۆرکردنەوە؛ خۆرەتاو کەفتن؛ خۆر خستنەوە؛ وەرەتاو وسەیوە ‹آسمان دوبارە آفتاب کرد: ئاسمان دیسان خوری کردەوە›.

**آفتاب گرفتن:** خۆرگرتن؛ خوەرگرتن؛ وەرگێرتەی: ١. بەرەو خۆر بوون؛ خۆرگیر بوون ‹این اتاقها آفتاب می‌گیرد؟: ئەم دیوانە خور ئەگرن؟› ٢. کەڵک وەرگرتن لە تیشکی خۆر ‹دارم آفتاب می‌گیرم: خەریکم خور ئەگرم› ٣. ڕۆژ گیران؛ خۆر گیران ‹آن روز آفتاب گرفتە بود: ئەو ڕۆژە خور گیرابوو›.

**آفتاب گز کردن:** پیاسەکردن؛ خیابان گەزکردن؛ زەمین پیمەی؛ ڕێگە ڕۆیشتنی بەر خۆر لە دەسبەتاڵی و بێکاریدا ‹دارد آفتاب گز می‌کند: خەریکە پیاسە دەکا›.

**آفتاب‌پرست** / 'āftābparast/: اسم. ١. ـها/ گوڵەسەنگ؛ کوچکەچۆرە؛ مراوکە؛ گیا دمارەکوڵ ٢. ـها؛ ـان/ قومقومە؛ قومقومەک؛ قومقموکە؛ قۆڕیانەزەردە؛ قۆڕیەزەردە؛ زەردە قۆڕە گومگموک؛ کەرپەزە؛ کەشتێلەسەرە؛ مالبا؛ بێژنگەسەر؛ خمخموک؛ خەمخەمۆکە؛ ڕۆژپەرست؛ خۆرپەرست؛ ؛ قژ؛ خمەگروو؛ خەمەگروو؛ فمخوک؛ شینشینک؛ کمکمە؛ لووس‌لووسک؛ تێرتێرە؛ سەرمازەڵە؛ جۆری مارمێلکەی ئەستوور و درێژە، زۆر زوو ڕەنگی خۆی دەگۆڕێ و بەڕەنگی دەوروبەری دەردێ: **آفتابگَردک؛ بوقلمون؛ حِربا** *[ادبی]*

**آفتابرو** / 'āftābrû/: صفت. ١. خۆرەتاو؛ هەتاوگیر؛ ڕووەو/ بەرەو خۆر؛ وەرەتاو؛ بەرۆژ. بەرانبەر: **سایەرو** ‹اتاق آفتابرو: ژووری هەتاوگیر› ٢. *[مجازی]* خۆر؛ زۆر جوان و لەبار؛ پرشنگ.

**آفتابزدگی** / 'āftābzadegî/: اسم. خۆرانگازی؛ خۆرەنگازی؛ گەرمەژنە؛ ڕۆژگەستوویی؛ ڕۆژبردوویی؛ تاوبردوویی؛ تاوانگازی؛ هەتاوبردوویی؛ وەربەردەیی؛ تاوانگازبوویی؛ نەخۆشینێکە بەهۆی زۆر مانەوە لە بەر تیشکی خۆر سەرهەڵدەدا و بە شێوەی بوورانەوە و یاو کردن خۆی پیشان دەدا ‹وقتی آوردندش دچار آفتابزدگی شده بود و حال بدی داشت: کاتێ هێنایان تووشی خۆرەنگازی ببوو، حاڵێکی خراپی بوو›.

**آفتابزده** / 'āftābzade/: صفت. تاوانگەز؛ خۆربردوو؛ تاوگەز؛ تاوەنگەز؛ تاوەگەز؛ هەتاوگەز؛ خۆرانگاز؛ خۆرەنگاز؛ وەربەردە؛ ڕۆژگاز؛ ڕۆژگەز؛ ڕۆژگەستی؛ هۆرگەستە؛ هۆرگەز؛ گەرمازۆ؛ تاوبردوو ‹شخص آفتابزده را باید در سایه قرار داد: تاوانگاز ئەبێ ببرێتە سێوەرەوە›.

**آفتابزردی** / 'āftābzardî/: قید. زەردەپەڕ؛ خۆرەزەردی خۆرئاوا؛ ئەنگۆرە؛ هەنگۆرە؛ هەنگقار؛ خۆرپەلەکۆ؛ وەرپەلەکۆ؛ وەرپەڕەی؛ وەرنیشتەنەکۆ؛ لە کۆتایی ڕۆژئاوا بووندا ‹می‌گفتند افتابزردی نباید خانه را جارو کرد: ئەیانگوت خورەزەردی خورناوا نابێ ماڵ گەسک بدرێ›.

**آفتابسنج** / 'āftābsanc/، ـها/: اسم. هەتاوپێو؛ ئامێرێک بۆ پێوانی ماوەی تابشتی ڕۆژانەی خۆر لە جێگایەکدا.

**آفتابسوختگی** / 'āftābsûxtegî/: اسم. تاوانگەزی؛ وەرانگەزی؛ تاوانبردوویی؛ خۆربردوویی؛ وشکەوبوویی؛ تاوانگازی؛ تاوبردەیی؛ سووتانەوە یان ڕەش‌هەڵگەڕانی پێست بە هۆی هەتاوەوە.

**آفتابسوخته** / 'āftābsûxte/: صفت. تاوانگەز؛ وەرانگەز؛ تاوانبردوو؛ تاوانگاز؛ تاوبردە؛ خۆربردوو؛ وەربەردە؛ تووشیاری تاوانگازی ‹صورت افتابسوخته‌ای داشت: دەم و چاوێکی تاوانگازی بوو›.

**آفتابگردان** / 'āftābgardān/، ـها/: اسم. ١. سەیوان؛ سایەبان ٢. چەتری سێبەر ٣. گوڵەبەڕۆژە؛ گوڵبەڕۆژ؛ ڕۆژامپەرێز؛ ڕۆژانپەرێز؛ ڕۆجیاپەرشت؛ ڕۆجیارپرێس؛ ڕۆزیارپەرس؛ هەتاوپەرس؛ گوکباخان؛ ڕوەکێکی لاسکی بەرز و گەڵا پانە و تا تۆمی نەکردووە گوڵەکەی دەگەڵ خۆر دەگەڕێ ٤. توو؛ تۆم؛ تووی گوڵەبەڕۆژە کە تۆمێکی چەور و بەتامە، دەیترووکێنن و زۆرتر ڕۆنی لێ‌دەگرن.

**آفتابگردک** / 'āftābgardak/ ☜ **آفتاب‌پَرَست-٢**

**آفتابگرفتگی** / 'āftābgereftegî/، ـها/: اسم. خۆرگیران؛ ڕۆژگیران؛ دەمێ کە مانگ دەکەوێتە نێوان زەمین و خۆرەوە.

**آفتابگیر**[1] / āftābgîr'، ـها/: اسم. بەربەرۆچکە؛ لاخوەر؛ شوێنی خۆرگیر.

**آفتابگیر**[2]: صفت. هەتاوگیر؛ خۆرگیر؛ وەرەتاو؛ هەبوون لە جێگایەک کە خۆر لێی دەدا.

**آفتابگیری** / āftābgîrî'/: اسم. هەتاوگیری؛ خۆرگیری: ۱. بار و دۆخ یان چۆنیەتی خۆرگیر بوون ۲. کار یان دۆخی لە بەر تیشکی هەتاودا بوون.

**آفتاب‌مهتاب** / āftābmahtāb'/: اسم. ئاڵنج و کۆڵنج؛ پشتەقێ؛ پەشتەمارێ؛ مازیەمازیالێ؛ گەمەیەک منداڵانەیە کە دوو کەس پشت بە پشتی یەکترییەوە ڕادەوەستن و قۆڵیان لە یەک گیر دەدەن و بە نۆبە کۆم دەبنەوە و ئەویتر بەرز دەکەنەوە.

**آفتاب‌نزده** / āftābnazade'/: قید. خۆر نەکەوتوو؛ خوەرەتاو هەڵنەهاتگ؛ نەمازێ؛ نەماجی؛ پێش خۆرکەوتن ‹صبح آفتاب‌نزده باید راه بیفتی: بەیانی خورنەکەوتوو، ئەبێ ڕێ بکەوی›.

**آفتاب‌نشین**[1] / āftābnešîn'، ـها؛ ـان/: اسم. وەرزێر؛ وەرزیەر: ۱. کەسێ کە لە گوند و لادێ کار دەکا ۲. فەلاح؛ کاریگەری کشت‌وکاڵ.

**آفتاب‌نشین**[2]: صفت. [کنایی] تەمەڵ؛ تەپ؛ کەهاڵ؛ هەمین؛ تەوەزەل؛ گەندەڵ؛ لەش‌گران؛ لەمەرە وەرەتاو.

**آفتابه** / āftābe'، ـها/: اسم. ئافتاوە؛ ئەفتاوە؛ هەفتاوە؛ ئافتاوێ؛ بریک؛ مسینە؛ مسینک؛ مەسین؛ لوولێنە؛ دەفرێکی وەکوو کووزوو، بە دەستە و لوولەیەکی بەرز بۆ شۆردن (بەتایبەت لە دەساو).

⊡ **آفتابه خرج لحیم کردن**: [کنایی] کەر بە کۆپان دان؛ بێخ دیوارکەندن و بانەناو پێ‌کردن؛ بۆ چاک‌کردنی شتێکی کەم بایەخ پارەیەکی زۆر خەرج‌کردن ‹تعمیر این ماشین آفتابه خرج لحیم کردن است: چاک‌کردنەوەی ئەم ماشێنە کەر بە کۆپان دانە›.

**آفتابه‌چی** / āftābečî'/: [فارسی/ ترکی] اسم. ڕەییس‌کناراو؛ ئاغای دەساو.

**آفتابه‌دار** / āftābedār'، ـها؛ ـان/: اسم. ڕەییس‌کناراو؛ کەسێ کە کاری پڕکردنەوەی ئەفتاوە و خاوێن‌کردنەوەی دەساوە. هەروەها: **آفتابه‌داری**

**آفتابه‌دزد** / āftābedozd'، ـها؛ ـان/: اسم. [کنایی] دەڵەدز؛ دزی کەم دەسەڵات ‹شما به این آفتابه‌دزد بدبخت می‌گویید راهزن؟: ئێوە بەم دەلەدزە بێچارەیە ئەڵێن چەتە؟›.

**آفتابه‌لگن** / āftābelagan'، ـها/: اسم. ئەفتاوەولەگان؛ ئافتاوە و لەگەنی چکۆلە، کە پێشووتر بۆ شۆردنی دەست و زار لە سەر سفرەوە بەکاریان دەبرد ‹غذا را که خوردند، صاحبخانه آفتابه‌لگن آورد و مهمانها دستشان را شستند: کە نانیان خوارد، خاوەن ماڵ ئافتاوە و لەگانی هێنا و میوانەکان دەسیان شۆرد›.

**آفتابی** / āftābî'/: صفت. ۱. خۆرەتاو؛ هەتاوی؛ خۆری؛ خوەری؛ بەهرەمەند لە هەتاو ‹روز آفتابی: ڕۆژی هەتاوی› ۲. هەتاوی؛ خۆری؛ خوەری؛ بە کاربەری هەتاویەوە ‹عینک آفتابی: چاویلکەی هەتاوی› ۳. خۆرلێداو؛ هەتاوی؛ خۆری؛ خوەری؛ ئامادە کراو لە بەر هەتاودا ‹کشمش آفتابی: مێوژی هەتاوی› ٤. [مجازی] ئاشکرا؛ دیار؛ خویا ‹خجالت می‌کشید جایی آفتابی بشود: خەجاڵەتی ئەکێشا لە جێگایەک ئاشکرا بێ›. هەروەها: **آفتابی شدن؛ آفتابی کردن**

**آفتامات** / āftāmāt'/: [روسی] ☜ **آفتومات**

**آفت‌زده** / āfatzade'، ـها؛ ـگان/: [عربی/

فارسی] صفت. ئـازاربردوو؛ تـەشـەلێداو؛ ئاکلێداو؛ ئافـەتبـردوو؛ ئـازاربردە ‹درختـان آفـتزده؛ مزرعـەی آفـتزده: دارگـەلی ئـازاربردوو؛ مەزرای تەشەلیداو›.

**آفتومـات** / āftomāt'، هـا/: [روسی]/اسم. ئافتامـات: ۱. [مکانیک] بـڕینبار؛ ئـامرازێکی کـارەباییـە لـە ماشـێندا ڤۆلـتاژی دینـام یـەکچـەشـن دەکاتـەوە ۲. نـاوە بـۆ جـۆرێ چەکی ڕووسی * **آفتامات**

**آفریـدگار** / āfarîdegār'/: اسم. [ادبی] خـوا؛ خواوەن؛ کردگار؛ ئافرێندە؛ ئافرێنەر؛ چێکەر.

**آفریـدن** / āfarîdan'/: مـصدر. متعـدی. //**آفریـدی**: ئافرانـدت؛ **مـی آفرینـی**: دەئـافرێنی؛ **بیـافرین**: بئافرێنـە// ئافرانـدن؛ خولقانـدن؛ بـەدیهێنـان؛ داهێنـان؛ سـێوراندن؛ دروستکـردن؛ وەش کـەردەی: ۱. ڕسـکاندن ‹جهـان را آفریـدن: ئافراندنـی جیهـان› ۲. وەدیهێنـان ‹شـادی آفریـدن: شـادی خولقانـدن› ۳. بـە یارمـەتی بـیر شـتێ بـەدیهێنـان ‹آفریدن شعر: داهێنانـی شـیعر› * **خلـق کـردن؛ بەوجود آوردن**. هەروەها: **آفریدنی**

■ صـفت فـاعلی: **آفریننـده** (ئافرێنـەر)/ صـفت مفعولی: **آفریده** (ئـافراو)/ مـصدر منفی: **نیافریـدن** (نەئافراندن)

**آفریـده** / āfarîde'، هـا؛ ـگـان/: اسم. [مجازی] خولـقاو؛ زینـدەوەر؛ گیانلـەبـەر؛ گیانـدار؛ گیانەوەر؛ ئارەسە؛ ئافراو.

**آفریقائی** / āfrîqā'î'/ ☜ **آفریقایی**

**آفریقـایی**[1] / āfrîqāyî'، هـا؛ ـان/: اسم. ئەفریقـایی؛ ئافریقـایی؛ هـەرکـام لـە خـەڵـکی سەر بە قورنەی ئەفریقا: **افریقایی؛ آفریقائی**

**آفریقـایی**[2]: صفت. ئـەفریقـایی؛ پـەیوەندیـدار یـان بـەسراو بـە قورنـەی ئـەفریقـاوە ‹گیاهـان آفریقـایی: گیاگـەلی ئـەفریقـایی›: **افریقـایی؛ آفریقائی**

**آفریکـان** / āfrîkān'/: [انگلیسی]/اسم. ئافریکان؛ زمانێ کـە لـە سـەدەی حـەڤدەهـەم بەملاوە، لە لایـەن کۆچـەرە هۆڵـەندیـەکانـەوە لـە ئـەفریقـای باشـووری بـەدیهـات و ئێـستە یەکێ لە زمانگەلی سەرەکی ئەو وڵاتەیە.

**آفـرین**[1] / āfarîn'، هـا/: صوت. ئافـەریـن؛ ئافەریم؛ ئافـەرەم؛ هـۆپ؛ هـەلالـتە؛ هـەلان بـۆ دەسـت خـۆش؛ وتـەی پـەسـندکـردن ‹آفـرین! همـین طـور بـرو جلـو: ئافـەریـن! هـەر وا بـڕۆ پێشەوە›.

⊡ **آفـرین خوانـدن/ کـردن**: [ادبی] ئافـەریـن وتن؛ ئافەریمکردن؛ هۆپکردن.

**آفرین گفـتن**: ئافـەریـن وتـن؛ ئافـەریم وتـن ‹بایـد بـە چـنین پـسری آفـرین گفـت: ئـەبێ بـە ئاوەها کوڕێ ئافەریم بێژی›.

ـ **آفرین**[2] /ـها؛ ـان/: پیوازه. ـخـولقێن؛ ـئـافرێن ‹نقشآفرین: نیگارخولقێن›.

**آفـرینش** / āfarîneš'، هـا/: اسم. ۱. بەدیهێنـەری؛ داهێنـەری؛ ئـافرێنی؛ کـار یـان ڕەوتی خولـقاندن؛ بـەدیهێنـان ‹آفـرینش جهـان: بـەدیهێنانـی جیهـان› ۲. [مجـازی] ئاسـەوار؛ خولـقاو؛ بـەرهـەمـی ئافرانـدن بـە گـشتی ‹نمایـشگاه آفرینـشهای هنـری: پێـشانگای ئاسـەوارە هونەریەکان›.

**آفریننـدگی** / āfarînandegî'، هـا/: اسم. خولـقێنەری؛ ئافرێنـەری؛ ئافرێنـەریـەتی؛ بـەدیهێنـەری؛ داهێنـەری؛ بـار و دۆخ یـان چۆنیـەتی ئافرێنـەر بـوون ‹قـدرت آفریننـدگی: توانای ئافرێنەری›.

**آفنـد** / āfand'، هـا/: اسم. [نظامی] ۱. شـەڕ و شـۆ؛ پـەیکـار؛ جـەنـگ ۲. هێـرش؛ پـەلامـار؛ پـلار؛ هـەڵـمەت؛ کـار یـان ڕەوتی دابـەڕزیـن؛ داپڕسکان.

**آفندیـدن** / āfandîdan'/: مـصدر. متعـدی. [نامتـداول] ۱. شـەڕکـردن؛ پـەیکـارکـردن؛

گزیەی ٢. هێرش بردن؛ پەلامار دان؛ پلار دان؛ داپڕسکاندن؛ دابەڕزاندن.

■ صفت مفعولی: **آفندیده** (داپڕسکاو)

**آفیش** / āfîš'، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ئافیش؛ لاپەڕەی گەورەی ڕاگەیاندن، زیاتر وێنەدار کە بە دیواریدا دەدەن.

**آقا**[1] / āqā'، ـها؛ ـیان/: [مغولی]/اسم. ١. *[نامتداول]* گەورە؛ سەروەر؛ مەزن؛ ئاغە؛ ئاغا ٢. کاکە؛ کاک؛ ئاغە؛ ئاغا؛ نازناوێک بۆ ڕێزلێنان کە لە هەوەڵ یان ئاخری ناوی پیاوانەوە بەکار ئەبرێت ‹آقا جمشید؛ احمد آقا: کاک جەمشید؛ ئەحمەد ئاغا› ٣. *[گفتاری]* مەلا؛ مەلا ‹آقا آمد و عقدشان کرد: مەلا هات و مارەیانی بڕی› ٤. *[گفتاری]* پیاو؛ پیاگ؛ مێرد ‹آقامان خانه نیست: پیاوەکەمان لە ماڵ نیە› ٥. ئاغە؛ ئاغا؛ کاکە؛ ئابرا؛ نازناوێک بۆ بانگ کردنی پیاوان ‹آقا! بفرمایید: ئاغە! فەرموون› ٦. ئاغە؛ ئاغا؛ ئەرباب ‹آقای خودم هستم و نوکر خودم: ئاغای خۆمم و نۆکەری خۆم› ٧. *[گفتاری]* نێر؛ نێرە؛ گیانلەبەری نێر (بەتایبەت لە چیرۆک یان بە سەرهاتدا) ‹آقا موشه: مشکە نێر› ٨. *[گفتاری]* بابە؛ باوک؛ تاتە ‹آقا جان: بابە گیان›.

**آقا**[2]: صفت. *[گفتاری]* پیاو؛ پیاگ؛ مێر؛ خاوەن کەسایەتی شیاو ‹برادرش یک پارچه آقا بود: براکەی پیاوێکی تەواو بوو›.

◙ **آقا شدن**: بوونە پیاو؛ گەورە بوون؛ وەکوو کەسێکی بەڕێز پێهاتن ‹با این سر و ریخت یکپارچه آقا شده‌ای: بەم سەر و سیماوە تەواو بوویە پیاو›.

**آقائی** / āqā'î'/: [مغولی] ☜ **آقایی**

**آقابالاسر** / āqābālāsar'، ـها/: [مغولی/ فارسی] اسم. *[تعریض]* کوێخا؛ قەیخا؛کەیخا ‹حالا دیگر این الف بچه آقابالاسر ما شده: ئێستا ئیتر ئەم مندالووکە بۆتە کوێخای ئێمە›.

**آقابالاسری** / āqābālāsarî'/: [مغولی/ فارسی] اسم. *[تعریض]* کەیخایی؛کوێخایی ‹دوست دارد آقابالاسری کند: پێی‌خۆشە کوێخایی بکا›.

**آقابزرگ** / āqābozorg'، ـها/: [مغولی/ فارسی]/اسم. *[گفتاری]* باوەگەورە؛ باوە؛ نازناوێ بۆ باوەگەورە ‹آقابزرگ از شهر برگشتند: باوەگەورە لە شار هاتنەوە›.

**آقاپسر** / āqāpesar'، ـها/: [مغولی/ فارسی] اسم. *[گفتاری]* کوڕی چاک؛ کوڕخاس؛ نازناوێ بۆ کوڕ ‹آقاپسر، مدادت افتاد: کوڕی چاک، قەڵەمەکەت داکەوت›.

**آقاجان** / āqācān'/: [مغولی/ فارسی]/اسم. *[گفتاری]* ١. بابە؛ باوکە؛ بابەلێ؛ تاتەلە؛ وشە بۆ ناو بردنی باوک ‹آقاجان آمد: بابە هاتەوە› ٢. خالۆ؛ مامە؛ لالە؛ لالۆ؛ کاکە؛ برالە؛ نازناوێ بۆ بانگ کردنی پیاوان ‹آقاجان، مواظب باش: خالۆ، هۆشت بێ›.

**آقاداداش** / āqādādāš'، ـها/: [مغولی/ ترکی] اسم. *[گفتاری]* ئابرا؛ ئاغەبرا؛ کاکەلێ؛ نازناوێک بۆ برای گەورەتر ‹آقاداداش رفته خارج: ئابرا ڕۆیشتووە بۆ هەندەران›.

**آقادایی** / āqādāyî'، ـها/: [مغولی/ فارسی] اسم. *[گفتاری]* خالۆ ئاغە؛ خالۆ گەورە؛ نازناوێکی ڕێزگرانەیە بۆ خالۆ، بەتایبەت خالۆی گەورە ‹آقادایی فرمودند: خالۆ ئاغە فەرموویان›.

**آقازاده** / āqāzāde'، ـها؛ ـگان/: [مغولی/ فارسی]/اسم. ئاغازادە؛ ئاغەزادە؛ نازناوێکی ڕێزگرانەیە بۆ کوڕی کەسێ ‹دیروز آقازاده به مدرسه نیامده بود: دوێنێ ئاغەزادە نەهاتبوو بۆ قوتابخانە›.

**آقاعمو** / āqā'amû'، ـها/: [مغولی/ عربی]/اسم. *[گفتاری]* ئامامۆ؛ ئاغەمەمۆ؛ نازناوێکە بۆ مامە، بەتایبەت مامەی گەورەتر ‹آقاعمو حالشان خوب نیست: حالی ئامامۆ باش نیە›.

**آقـــامنش** / 'āqāmaneš/: [مغـــولی/ فارســـی] *صـفت.* پیاوانـه؛ بـەڕێـز ونرخـدار؛ کـاو ‹مـرد آقامنشی است: پیاوێکی پیاوانەیە›.

**آقاموشـــه** / 'āqāmûše/: [مغـولی/ فارسـی] /*اسـم.* *[گفتاری]* ۱. مـشکە نێـر؛ قـارەمـانی تاقمـێ لـە چیرۆکگەلی مندالان ۲. مشک؛ ملە.

**آقانـنـــه** / 'āqānane/: [مغـولی/ فارسـی] /*اسـم.* *[گفتـاری]* دایـەخـانم؛ داپـیر؛ نازناوێـک بـۆ دایەگـەورە، بـەتایبـەت دایـەگـەورەی باوکییـە ‹آقانـنه برایمان قـصه مـی‌گفـت: دایـەخـانم چیرۆکـی بۆ دەگێڕاینەوە›.

**آقـــایی** / 'āqāyî، ـهـا/: [مغـولی/ فارسـی] /*اسـم.* گـەورەیـی: ۱. بـەڕێـزی ‹آقـایی از سـر و رویـش مـی‌بارید: گـەورەیـی لـە سـەر و سیمای دەباری› ۲. ســـەروەری ‹در آقــاییش شـــکی نیـــست: گەورەیی ئەو بێ‌قسەیە› ❋ **آقائی**

**آقبـــانو** / 'āqbānû/: [مغـــولی/ فارســـی] /*اسـم.* ئاغەبـانوو؛ ئاغابـانوو؛ ئاخـەبـانوو؛ پارچـەیـەکـی ناسـک کـە لـە ڕابـردوودا دەکرایـە سـەرپـێچ و چارشێو.

**آقطـــی** / 'āqtî/: [از یونـانی] /*اسـم.* گێجـەگیـا؛ کـەزنـەزان؛ کـەسنـزان؛ ورِ؛ گیابۆنکـە؛ نـاوی چەن جۆر ڕوەکی جەنگەڵی بۆگەنە.

◙ **آقطـــی ســـیاه:** گـــەنـــەدار؛ جۆرێـــک گێجـەگیـای گـوڵ سـپیە کـە بـۆنێکی ناخۆشی هەیە.

**ـــ اک** / 'āk/: *پسوند.* ۱. ـمـەنی؛ ـئـەمـەنی؛ ـــاک؛ شـیاو بـۆ کـارێ ‹پوشـاک؛ خـوراک: پۆشەمەنی؛ خـواردەمـەنی› ۲. ـاو؛ ـیـاگ؛ ـیاو؛ ـــاگ؛ ـیـا؛ ـواو؛ سـازندەی ئـاوەڵـناوی بەرکاری ‹کاواک: کۆڵراو›.

**آکـــادمی** / 'ākādemî، ـهـا/: [فرانـسوی] /*اسـم.* ئاکـادێمی: ۱. کـۆڕی زانیـاری ۲. فێرگـەی بەرزی زانستی و هونەری.

**آکادمیـسین** / 'ākādemisyan، ـهـا/: [فرانـسوی] /*اسم.* ئەندامی کۆڕ.

**آکادمیـــک** / 'ākādemîk/: [فرانـسوی] *صـفت.* زانـستگایی؛ ئاکادێمیـک ‹تحـصیلات آکادمیـک: خوێندنی زانستگایی›.

**آکـــاردئون** / 'ākārde'on، ـهـا/: [فرانـسوی] /*اسـم.* ئاکـاردیئۆن؛ جـۆرێ ئـامێری مووسـیقایە کیـسەیەکی فانووسـی لـە بنپاڵـیدایە، بـەو کیـسەوە بـا هـاتوچۆ دەکـا و دەنگـی سازەکە پێک‌دێنێ.

**آکـــاردئونی** / 'ākārde'onî/: [فرانـسوی] *صـفت.* ئاکـاردیئۆنی؛ فانووسـی؛ دەق‌کـراو لـەسـەر یـەک وەکـوو ئاکـاردیئۆن ‹درِ آکاردئونی: دەرگـای ئاکاردئونی›.

**آکـــاژو** / 'ākājû، ـهـا/: [فرانـسوی] /*اسـم.* کورسـی‌کـەمـەر؛ گـوڵ‌شـەیتـان؛ ئاکـاژۆ؛ داری سـەر بـە دەڤـەرانی گـەرمیـان لـە تـیرەی سرینچکە تاڵە، کە بـەرەکـەی خـواردەمـەنیـە: **ماهون؛ بلادُر آمریکایی؛ بَلادُر مغربی**

**آکـــان** / 'ākān/: /*اسـم.* ئاکـان: ۱. هـــۆزی ڕەش‌پێـستی ڕۆژهـەلاتی ئافریقـا ۲. /ـهـا/ هەریـەکـە لـە کـەسانی ئـەو هـۆزە ۳. زمـانی ئەو هۆزە.

**آکبنـد** / 'ākband/: [از انگلیـسی] *صـفت.* ئـاک؛ دەس نـەخـواردوو: ۱. بـەسـتەبـەنـدی‌کـراوی کارخانە ‹ایـن تلویزیـون را وقتـی خریـدم آکبنـد بـود: ئـەم تـەلـەفیزیۆنـەم کاتـێ کـڕی ئـاک بـوو› ۲. *[مجـازی]* نـوێی هێـشتا دەس‌نـەخـواردوو ‹تلویزیون آکبند: تەلەفیزیۆنی ئاک›.

**آکـپ** / 'ākop، ـهـا/: /*اسم.* *[نامتـداول]* نـاوگوپ؛ نـاوەوەی گـوپ؛ لاکـپ؛ هۆنـدرێ دەڤـی ‹آکُپ خودش را گاز گرفت: قەپی کردە ناوگوپی خۆیا›.

**آکتور** / 'āktor، ـهـا/: [فرانسوی] /*اسم.* ئـەکتـەر؛ بازیکەری پیاو؛ هونەرپیشەی پیاو.

**آکتـــورس** / 'āktores، ـهـا/: [فرانـسوی] /*اسم.* *[نامتـــداول]* ئـــەکتـــۆرێس؛ بازیکـــەری ژن؛

دندووک خوار.

**ـ انه** / āne'/: پسوند. ـانه: ١. وەکوو؛ وەک؛ هەروەک؛ پیسەو ‹مردانه: پیاوانە› ٢. لە بەرامبەر؛ بە چەشن یا بۆ هەر یەک ‹سالانه: سالانە› ٣. بە بۆنەیەک یان لەبەر هەبوونی کارێ یا پلەیەکی تایبەت ‹شاگردانه؛ عیدانه: شاگردانە؛ جەژنانە›.

**آنها** / ānhā'/: ضمیر. [گفتاری] ئەوان؛ ئەوانە؛ ئەونە؛ وان؛ یانە؛ وینە؛ ئانێ؛ ئەونی؛ ئادێ؛ هین؛ جێناوی هێما بو سێهەم کەسی کۆ.

**آن‌هم** / ānham'/: قید. ئەویش؛ ئادیچ: ١. ئەووەش؛ وەش ‹بیچاره آن زن آبستن بود، آن‌هم در شهر غریب: ئەو ژنە داماوە دوگیان بوو، ئەویش لە شاری غەریبدا› ٢. بەتایبەت؛ نەخوازە؛ نەخوازەلا؛ خازما؛ خوازما ‹اینجا دکتر پیدا نمی‌شود آن‌هم نصف شب: لێرە دوکتۆر پەیدا نابێ، نەخوازە بە نیوەشەودا›.

**آنهمه** / ānhame'/: قید. ئەوهەمووە؛ ئەوگشتە؛ ئاگردە ‹چطوری می‌خواهی آنهمه را بخوری: چۆن ئەتەوێ ئەوهەمووە بخۆی؟›.

**آنی** / ānî'/: [عربی/ فارسی] صفت. ١. دەسبەجێ؛ خێرا؛ زوو؛ گرڕ ‹تصمیم آنی: بریاری دەسبەجێ› ٢. کوتوپڕی؛ تاوـتاوی؛ بێ‌درێژە ‹هوسهای آنی: وازگەلی تاوـتاوی›.

**آوا** / āvā'، ـها/: اسم. [ادبی] ١. دەنگ ‹آوای زنگ: دەنگی زەنگ› ٢. [زبان شناسی] بڕگە؛ بڕ؛ هەرکام لەو دەنگانەی زبان.

**آوائی** / āvā'î'/ ☜ **آوایی**

**آوابر** / āvābar'، ـها/: اسم. ئایفۆن.

**آوار** / āvār'، ـها/: اسم. کەلاوە؛ ئاوار؛ لاوار؛ دار و پەردوو؛ سەخمە: ١. تەپسە؛ تەپاوکە؛ ئەو شتانەی بە هۆی ڕووخانی سرمیچ یان دیوارەوە بە جێ مابێ ‹مردم در میان آوارها به دنبال آشنایان خود می‌گشتند: خەلکی لە نێو کەلاوەکاندا بە دوای ئاشناکانیاندا دەگەڕان› ٢. ئاڕفتە؛ مالی ڕووخاو ‹چند نفر را از زیر آوار درآوردند: چەن کەسیان لە ژێر سەخمە دەرهێنا›.

▣ **آوار شدن**: [گفتاری] داڕووخان؛ ڕمان؛ ڕمیان؛ وریەی؛ داڕووخانی کوتوپڕی سرمیچ، دیوار یان تاشەبەرد ‹سقف آوار شد روی سرشان: سرمیچەکە داڕووخا بە سەریاندا›.

**آوارگی** / āvāregî'، ـها/: اسم. ئاوارەیی؛ ڕەبەنی؛ دەربەدەری؛ هەلوەدایی؛ بێ‌مال و حالی؛ بەرەزەیی؛ باشیلی؛ دەرەندوویی؛ دووری لە ولاتی خۆیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ئاوارە بوون.

**آواره** / āvāre'، ـها؛ ـگان/: صفت. ئاوارە: ١. دەربەدەر؛ دەروەدەر؛ مشەخت؛ مەرژێر؛ بێ‌لانە؛ بێ‌هێلانە؛ ڕەبەق؛ بێ‌ئەنوا؛ بێ‌مال؛ ئەراگێل؛ بێلیقە؛ بەرەزە؛ باشیل؛ بێ‌خانەولانە و جێگەی نیشتەجێ بوون ‹صاحبخانه بیرونمان کرد و در این فصل سرما آواره شدیم: خاوەن مالەکەمان دەری کردین و لەم وەرزی سەرمایەدا ئاوارە بووین› ٢. تار؛ تەرە؛ بەرەزە؛ ئەودال؛ هەلوەدا؛ ئەلوەدا؛ تێنوارە؛ پەڕەوازە؛ پەرتەوازە؛ باشیل؛ تراقیە؛ دوور لە مال و زێدی خۆ ‹جنگ هزاران نفر را آواره کرد: شەڕ هەزاران کەسی ئاوارە کرد› ٣. سەرگەردان؛ دەرەندوو؛ بێ‌پشتیوان ‹شش ماه توی اداره‌ها آواره بودم تا کار پسرم را درست کردم: شەش مانگ لە مەزرینگەکاندا ئاوارە بووم تا کاری کوڕەکەم جۆر کرد›. هەروەها: **آواره بودن؛ آواره شدن؛ آواره کردن؛ آواره گشتن**

**آواری** / āvārî'/: صفت. ئاواری؛ پەیوەندیدار بە ئاوارەوە ‹خاک آواری؛ سنگ آواری: خاکی ئاواری؛ بەردی ئاواری›.

**آواز** / āvāz'، ـها/: اسم. ١. [ادبی] دەنگ ‹از چاه آوازی شنید: لە بیرەکەوە دەنگێکی بیست› ٢. [موسیقی] گۆرانی؛ گورانی؛ ئەفاس؛ ستران؛

کـۆت؛ زار؛ لاوک؛ کـزه ‹آواز زیـرک دوسـتداران زیـادی دارد: گـۆرانی زیـرەک هـۆگری زۆری هـەیـە› ٣. ئـاواز؛ بـەشـێکی جیـاواز لـە دەسـگاگەلی مووسـیقای ئێـرانی (بـریتین لـە ئیسفەهـان، بـەیـاتی تـورک، ئـەفشاری، دەشـتی، ئـەبووعـەتـا) ٤. چریکـە؛ جریکـە؛ جیکـە؛ دودەنگـە؛ ئـاواز؛ دەنگـی پـەلـەوەر، بـەتایبـەت باڵـندەی خۆشـدەنـگ ‹آواز بلبـل: چریکـەی بلبل›.

▣ **آواز دسـتەجمعـی:** هـەڤئـاواز؛ هـەوای گۆرانی بە کۆمەڵ.

**آواز کوچەباغی:** گۆشـەیـەک (بـەشـێک) لـە ئاوازی مووسیقای ئێرانی.

▣ **آواز خوانـدن:** ئـاواز خوێـندن: ١. خۆنـدن؛ خـۆنن؛ دەنـگ هـەلاوردن؛ گـۆرانی گـوتن؛ چرین؛ دەرهێنانی دەنـگ بـە ئاهـەنگـەوە ‹از خوشـحالی آواز مـی‌خوانـدم: لـە خۆشـیانا ئـاوازم دەخویند› ٢. گـۆرانی وتـن؛ گـۆرانی واتـەی؛ چـرین؛ کـۆت‌کـردن؛ خۆنـدن؛ خـۆنن ٣. چریکاندن؛ بەدیهـاتنی دەنگـی پـەلـەوەر بـە ئـاوازەوە ‹بلـبلان آواز مـی‌خواندنـد: بولبـولان ئەیانچریکاند›.

**آواز دادن:** *[ادبـی]* بانـگ‌کـردن؛ قـاوکردن؛ گـازکردن؛ چریـەی ‹مـرد آواز داد، ای رهگـذرا!: پیاوەکە بانگی کرد، هۆ کاکی ڕێبوار!›.

**آوازخـوان** / āvāxān'، ـهـا/: *اسـم.* گـۆرانی‌بێـژ؛ گـۆرانی‌وێـژ؛ سـتران‌بێـژ؛ گـۆرانی‌واچ؛ ئاوازخوێن؛ هۆرەچڕ؛ دەنـگ‌چڕ؛ کـەسـێ کـە ئـاواز دەخوێنـێ، بـە تایبـەت ئـەوەی کـاری گۆرانی‌بێژی بێت: **آوازەخوان**

**آوازخـــوانی** / 'āvāzxānî/: *اســـم.* گـۆرانی‌بێـژی؛ گـۆرانی‌وێـژی؛ سـتران‌بێـژی؛ گـۆرانی‌واچـی؛ ئـاوازخوێنی: ١. کـار یـان ڕەوتی خوێندنـەوەی ئـاواز ‹همـە سـرگرم آوازخوانی بودنـد: هـەموو خـەریکـی گـۆرانی‌بێـژی بوون› ٢. پیشەی گۆرانی‌بێژ ***آوازەخوانی**

**آوازە** / 'āvāze/: *اسـم.* *[ادبـی]* ناوبانـگ: ١. قـوو؛ ئـەوی کـە خـەڵکی لـەبارەیـەوە قـسە دەکەن ‹آوازەی او در همـە جـا بـە گـوش مـی‌رسید: ناوبـانگی لـە هـەمـوو جێگایـەکـدا دەبیـسرا› ٢. نـاوداری؛ ئـاوازە؛ وتـوویژێکـی زۆر (زۆرتربـاش) سەبارەت بە کەسـێ لـە نێـو خـەڵکیدا ‹شاعر بلند آوازە: شاعیری بەناوبانگ›.

**آوازەخوان** / 'āvāzexān/ ☜ **آوازخوان**

**آوازەخوانی**/ 'āvāzexānî/ ☜ **آوازخوانی**

**آوازی** / 'āvāzî/: *صفت.* ئـاوازی؛ پێـوەندیـدار یـان پاڵـدراو بـە ئـاوازەوە ‹موسـیقی آوازی: مووسیقای ئاوازی›.

**آواشناسـی** / 'āvāšenāsî/: *اسـم.* دەنـگ‌ناسـی؛ زانـستی ناسـینەوەی دەنگگـەلی تایبـەت بـە زمانێک. هەروەها: **آواشناس**

**آوانـس** / 'āvāns/: [فرانـسوی] *اسـم.* قـەلان؛ مـووس؛ پـێ‌بـەخـشی: ١. بـووردن یـان کۆمەکێ کە زۆرتـر لـە مـافی وەرگـرەکـەیـەتی ٢. بەخشراوە؛ کاکەبەشانە.

▣ **آوانـــس دادن:** قـــەلان دان؛ مـــووس دان؛کاکە بەشانەدان .

**آوانگـــارد** / 'āvāngārd/: [فرانـسوی] *صـفت.* پێـشڕەو؛ پێـشتاز؛ ڕەمکـێش ‹هنـر آوانگـارد: ادبیـات آوانگـارد: هونـەری پێـشڕەو؛ وێـژەی ڕەمکێش›.

**آوانگـاری**/ 'āvānegārî، ـهـا/: *اسم.* فۆنێتیـک؛ کار یـان ڕەوتی نووسـینی بڕگـەگـەلی زمانێـک بە نیشانەگەلی تایبەت.

**آوانگاشـــــــتی** / 'āvānegāštî/: *صـــــفت.* فونێتیکی؛ پەیوەندیدار بە فونێتیکەوە.

**آوایـــــی** / 'āvāyî/: *صــفت.* ١. فـــونێتیکی؛ پێوەندیدار یان سەربـە دەنگـە سـەرزاریـەکـانی وشـــەگـــەلی زمانێـــک ٢. فونولـــۆژی؛ پەیوەندیدار بە زانستی فونێتیکیەوە ***آوائی**

**آوخ** / āvax'/: *صوت. [ادبی]* ئاخ؛ ئاهـ ؛ ئۆف؛ وشەیەک بۆ نیشاندانی پێ ناخۆش بوون ‹آوخ از این جهان نافرجام: ئاخ لەم دنیا بێ سەر و بنە›.

**ـ آور** / āvar'، ـان/: *پیواژە.* ١. ـ دار؛ دارا؛ بە ـ ‹نام‌آور: ناودار› ٢. ـ اوەر؛ـ هێنەر؛ـئار؛ ـئاور؛ ـ ئێنەر؛ـئێن؛ـ هێن؛ ‹سودآور: قازانج‌هێنەر›.

**آورتا** / āvortā'/: [انگلیسی]/*اسم.* ئائۆرت؛ سووره دەماری هەرەگەورەی بڕبڕەداران.

**ـ آورد** / āvard, 'āvord'/: *پیواژە.* ـ هات؛ ـکەوت؛ ـیاو؛ بە دەست هاتوو؛ هێنراو ‹دستاورد: دەسهات›.

**آوردن** / āvardan, 'āvordan'/: *مصدر. متعدی. لازم.* //**آوردی**: هاوردت؛ **می‌آوری**: دێنی؛ **بیاور**: بێنە// ☐ *متعدی.* هێنان؛ هاوردن؛ ئاوردن؛ هانین؛ ئانین؛ ئاردن؛ ئێنان؛ ئاردەی؛ وەراندن؛ بارین: ١. شتێ یان کەسێ بە بیسەر، بێژەر، کەس یا جێگایەکی دیاریکراو نێزیکەوەکردن یا پێگەیاندن ‹آوردن آزاد به مدرسه: هینانی ئازاد بۆ قوتابخانە› ٢. نومایشدان؛ پیشان‌دان ‹عید را آوردن: جێژن هینان› ٣. گوتن؛ دەربڕین ‹این نکته را در کتابهای مختلف آورده‌اند: ئەم خاڵەیان لە کتێبە جۆرواجۆرەکاندا هیناوە› ٤. پێک‌هێنان؛ دابین‌کردن ‹این همه پول را ازکجا آوردی؟: ئەم هەموو پوولەی لە کوێ هینا؟› ☐*لازم.* ٥. بەرهەم هێنان؛ دروست‌کردن ‹بچه آوردن: منداڵ هینان› ٦. ڕووبەڕوو بوونەوە لە گەڵ ڕووداوێکدا ‹بد آوردن؛ خوب آوردن: خراپ هێنان؛ باش هینان› ٧. گێڕانەوە ‹آورده‌اند که...: گێڕاویانەتەوە کە...› ٨. کرداری هاوکرد لە چاوگی جۆرواجۆردا ‹بە دست آوردن: بە دەس هێنان›. هەروەها: **آوردنی**

■ صفت فاعلی: **آورنده** (هێنەر)/ صفت مفعولی: **آورده** (هێنراو)/ مصدر منفی: **نیاوردن** (نەهێنان)

**آورنده** / āvarande'، ـها؛ ـگان/: *صفت.* هێنەر؛ هاوەر؛ ئاوەر؛ خاوەن تایبەتمەندی یان توانستی هاوردن.

**ـ آوری** / āvarî'، ـها/: *پیواژە.* ـداری؛ دۆخ یان چۆنیەتی دارا بوونی شتێ ‹نام‌اوری: ناوداری›.

**آوریل** / āvrîl'/: [فرانسوی]/*اسم.* ئاپریل؛ مانگی چوارەمی ساڵی زایینی کە ٣٠ ڕۆژە و لە ١٢ی خاکەلێوەوە دەست‌پێدەکا.

**آومتر** / āvometr'، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* ئاڤۆمیتر؛ ئامێری پێوانی ئامپێر، ڤۆڵت و ئوهم لە کەرەسەی کارەباییدا.

**آوند** / āvand'، ـها/: *اسم.* ئاوخۆرە: ١. *[گیاه‌شناسی]* ئاوەن؛ ئاونە؛ ناوەرۆکی لق کە تەڕایی ڕادەگوێزی ٢. *[قدیمی]* لیوان؛ قومقومۆک؛ پیالە و شەربەی ئاوخواردنەوە.

▣ **آوند آبکش**: ئاوەنی ئاوبەر؛ ئاوەخۆرە؛ لوولەیەکی باریک و درێژ کە شیرەی پەروەردە لە گەڵاکانەوە بەرەو ئەندامگەلی دیکەی گیا دەبا.

**آوند چوبی**: ئاوەنی چێوی؛ ناونێرک؛ ناودۆک؛ دەربازێک کە ئاو و ماکی بووژانەوە لە ڕیشەوە دەگەیێنێتە گەڵای گیا.

**آوندی** / āvandî'/: *صفت.* ئاوخۆرەیی؛ ئاوەنی؛ ئاونەیی: ١. خاوەن ئاوەن ‹گیاه آوندی: گیای ئاوەنی› ٢. پێوەندیدار یان پاڵدراو بە ئاوەنەوە ‹دستگاه آوندی: کەرەسەی ئاوەنی›.

**آونگ** / āvang'، ـها/: *اسم.* ئاونگ؛ ئاوەنگ؛ کاروانە: ١. *[فیزیک]* شندل؛ هەڵوەسراوی بە هات‌وچۆ ٢. ئانگوو؛ دارەلۆز؛ مێلاق؛ مەلاق؛ هەر شتێکی هەڵواسراو، بەتایبەت هێشووی ترێ یان میوەیەکی‌تر.

**آویتامینوز** / āvîtāmînoz'/: [فرانسوی]/*اسم.*

[پزشکی] ئاڤیتامینۆز؛ نەخۆشی و گرانباری لەش بە بۆنەی کەمەوە بوونی ڤیتامینی پێویست.

**آویختگی** / āvîxtegî'/: [اسم]. دالەقاوی؛ هەلواسیاوی؛ هەلواسراوی؛ ئالۆچیایی؛ دالۆزاوی؛ داچەلاوی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی هەلواسیان.

**آویختن** / āvîxtan'/: [مصدر. متعدی. لازم]. //**آویختی**: هەلتواسی؛ **می آویزی**: هەلدەواسی؛ **بیاویز**: هەلواسە// □ [متعدی]. ۱. هەلواسین؛ هەلاوەسین؛ هەلاواسین؛ هێلاوستین؛ هلاڤیشتن؛ هەلخستن؛ هۆرئاسپنەی ‹به درخت آویختن: بە دارەوە هەلواسین› ۲. داهێشتن؛ شۆڕەوکردن؛ داچکاندن؛ دەلالەکۆچکێ کردن؛ داچەلاندن؛ ئاوێزان کردن؛ ئالۆچنایرە ‹از درخت اویختن: لە دارەوە شۆرەوکردن› ۳. [ادبی] شەڕکردن؛ دەستەویەخە بوون؛ ئاوقا بوون؛ گژیەی؛ گژیای □[لازم]. ٤. هەلواسران؛ داهێلڕان؛ دالەقیان؛ ئاوێزان بوون؛ دارەلۆز بوون؛ ئالۆچیایرە؛ ئەرەئاسیەی ‹به درخت آویختن: به دارەوە هەلواسران›. هەروەها: **آویختنی**

■ صفت فاعلی: **آویزنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **آویخته** (هەلواسراو)/ مصدر منفی: **نیاویختن** (هەلنەواسین)

**آویخته** / āvîxte'/: [صفت]. دالەقاو؛ هەلواسراو؛ هەلاوەسراو؛ هەلاوێزاو؛ ئالۆچیا.

**آویز** [1] / āvîz'/: [اسم]. ۱. [ـها] ئاوێز؛ شروە؛ هەرشتێ کە بۆ ڕازاندنەوەی چرا پێیەوە هەلیدەواسن ۲. [ـها] ئاوێز؛ بەردی زۆر بەنرخ کە بۆ خەملاندن لە گۆشەوارە و سینەرێزەوە ئاوێزانی دەکەن ۳. [ـها] گولەنگ؛ ئاوێز ‹اویز پرده: گولەنگی پەردە› ٤. [ادبی] شەڕ؛ پەیکار ‹آهنگ آویز دارد: بەتەمای شەڕە›.

ـــ **آویز** [2]: [پیوازه]. ۱. ـــ هەلواس؛ ـئەلۆز؛ ـداهێل؛ ـداچەل؛ هەلواسراو ‹سقف‌آویز: بە میچەوە هەلواسراو› ۲. ـــ ئاوێز؛ شیاو بۆ هەلواسینی شتێ ‹رخت‌آویز: ڕەخت‌ئاوێز›.

**آویزان** / āvîzān'/: [صفت]. دالەقاو؛ هەلواسراو؛ هەلاوەسراو؛ ئاوێزان؛ دور؛ دوولویز؛ ئەلخ؛ هادار؛ میوەک؛ شۆڕەوەبووگ؛ داهێندراو؛ بەل؛ دوڕ؛ بەلەچەک؛ دەنگلەوێز؛ دارەلووس؛ داهێلاو؛ ئالۆچیا؛ هەرشتێکی لە سەرەوە دابەسراو و لە خوارەوە ئازاد ‹چراغ زنبوری از سقف آویزان بود: چرا تۆریەکە هەلواسرابووە میچەکەوە›.

▣ **آویزان شدن**: ئاوێزان بوون؛ هەلواسران؛ هەلواسیان ‹از دستگیره آویزان شدن: بە دەسەگیرەوە هەلواسیان›.

**آویزان کردن**: ئاوێزان کردن؛ هەلواسین؛ ئالۆچنایرە ‹کلاهش را به قلاب آویزان کرد: کلاوەکەی بە قولابەکەوە ئاوێزان کرد›.

**آویزه** / āvîze'/: ۱. ☜ **آویز** [1] ـ ۲،٤ ۲. ☜ **آپاندیس**

**آویشن** / āvîšan'/، ـها: [اسم]. جاترە؛ جاتیرە؛ هەزبی؛ هەزبێ؛ هەزوێ؛ هەزوە؛ ئەزبی؛ ئەزبووە؛ هەزبێلە؛ هەزبیە؛ ئەزبۆلە؛ ئەزبوولە؛ هوزبێ؛ هەزبۆ؛ هەزبۆوە؛ هەزبە؛ بۆخۆشکە؛ چەویر؛ هەویشن؛ گیایەکە لە تیرەی پنگ.

▣ **آویشن کوهی**: مشک تەرامشیخ؛ جاترەکێویلە؛ هەزبیەکێفیلە؛ هەزبرکێفیلە؛ هەزوەکیفی؛ چاییە شاخی؛ گیایەکە بۆ دەرمان دەشێ.

**آه** [1] / āh'/، ـها: [اسم]. ئاهـ ؛ ئاخوداخ؛ هەناسەی خەمباری.

▣ **آه کسی گرفتن**: [کنایی] هەناسەی کەسێ پێکان؛ ئاهی کەسێ گیران؛ تووکی کەسێ کاریگەر بوون.

**آه کشیدن**: ئاخ هەلکێشان؛ ئاخوداخ

کردن؛ هەناسە هەڵکێشان؛ بە هۆی خەم و کەسەرەوە هەناسەی درێژ هەڵکێشان.
**آه**[2]: *صوت*. ١. ئاهـ ؛ ئۆف؛ ئاخ؛ وشەیەک بۆ دەربڕینی خەم و خەفەت یا سەرسوڕمان ٢. ☜ **آخ**
▣ **آه در بساط نداشتن:** *[مجازی]* لە سەر ساجی عەلی بوون؛ لە سەر سیفر خولانەوە؛ ڕشکی شکە نەبەردەی؛ زۆر هەژار و دەستەنگ بوون.
**آه در سینه پنهان کردن:** *[مجازی]* خەفەت قووت دانەوە؛ داپۆشاندنی خەفەتی خۆ؛ دەرنەبڕینی کوڵ و کەسەری سەر دڵ.
**آها** / āhā'/: *قید. [گفتاری]* ئەها؛ بەڵێ؛ ئەرێ: **آهان**
**آهار** / āhār'/: *اسم*. ١. ئاهار؛ ئاش؛ تراوی نیشاستە، کەتیرە یان جەوی کە لە قوماش یان کاغەزی دەدەن، ڕەپ و لووسی دەکا ٢. /ـها/ گوڵەتیکە؛ گوڵەدەقاق؛ شەسپەرە فەرەنگی.
▣ **آهار زدن:** ئاهار لێدان؛ دەق لێدان؛ شۆ لێدان؛ ئاش کردن.
**آهاردار** / āhārdār'/: *صفت*. ئاهاردار؛ ئاهاری ‹پارچەی آهاری: قوماشی ئاهاردار›.
**آهاردن** / āhārdan'/: *مصدر. متعدی. [نامتداول]* ئاهاردارکردن؛ ئاهاری کردن: **آهاریدن**
**آهارزنی** / āhārzanî'/: *اسم*. ئاش‌ماڵین؛ شۆلێدان؛ کار یان ڕەوتی پێداساوینی ئاهار بە ڕووی شتێکدا یان گەوزاندنی شتێک لە تەڕاوی ئاهاردا.
**آهاری** / āhārî'/: *صفت*. ئاهاری؛ ئاهاردار ‹یقەی آهاری: یەخەی ئاهاری›.
**آهاریدن** / āhārîdan'/ ☜ **آهاردن**
**آهان** / āhān'/ ☜ **آها**
**آهای** / āhāy'/: *صوت. [گفتاری]* ئەی؛ های؛ هەی؛ ئوهۆی؛ ئەهای؛ هۆی؛ دا؛ هێست؛ پشت؛ هێی؛ هەرێ؛ وشەیەک بۆ ئاگادار کردنەوە یا بانگ کردن ‹آهای، با توام! آهای، مواظب باش!: هۆی، لەگەڵ تۆمە!؛ های، هۆشت بێ!›.
**آهرو** / āhrû'/، ـها/: *اسم*. پایە؛ پاچکە؛ داری ماڵبەند.
**آهستگی** / āhestegî'/: *اسم*. ١. ئەسپاییەتی؛ هەسپایەتی؛ هێوری؛ شێنەیی؛ هێمنی؛ هێونی؛ هێدیکایی؛ بە پەلە نەبوون ‹از آهستگی قدمهایش پیدا بود...: لە ئەسپاییەتی هەنگاوەکانیدا دیار بوو...› ٢. نزمی؛ نەوی بوونی دەنگ ‹آهستگی صدایش نشان می‌داد که نمی‌خواهد کسی بشنود: نزمی دەنگی وای دەنواند کە نایەوێ کەس بیبیسێ›.
**آهسته**[1] / āheste'/: *صفت*. ئەسپا؛ هەسپا؛ هێواش؛ هێدی؛ هێمن؛ هێون؛ شێنە؛ ئارام؛ هێدیکا؛ یاوە؛ هەستە؛ بێ‌کش؛ لەسەرخۆ: ١. یاو؛ جووڵانەوەی لەسەرخۆ و بێ‌پەلە ‹حرکت آهسته؛ چرخش آهسته: بزاڤی هێدی؛ خولانەوەی هێواش› ٢. بە توندی و تەوژمێکی کەم ‹تکان آهسته: تەکانی هێدی› * **آرام؛ یواش** *[گفتاری]*
**آهسته**[2]: *قید*. هێواش؛ یەواش؛ هێدی؛ شێنەی؛ یاوەیاوە؛ بەسپایی؛ بەئەسپایی؛ بەحەستەمی؛ بەئەستەمی؛ بەهێونی؛ بەهێمنی؛ بە هێواشی: ١. بێ‌پەلە ‹آهسته غذا می‌خورد: هێواش نانی دەخوارد› ٢. بە بێ‌تەوژم و زۆر ‹آهسته در را باز کرد: بەسپایی درگاکەی کردەوە› ٣. بەدەنگی نزم ‹آهسته گفت: مواظب جیبت باش: بەهێمنی وتی: هۆشت بە گیرفانتەوە بێ› * **آرام؛ یواش** *[گفتاری]*
**آهسته‌کاری** / āhestekārî'/، ـها/: *اسم. [ادبی]* کەمتەرخەمی؛ خاوی؛ تەوەزەلی؛ تەمەڵی؛ تەپەیی.
**آهک** / āhak'/: *اسم*. ئاهەک؛ ئەهاک؛

قسل؛ قسر؛ کلس؛ کسل؛ کشل؛ زقل؛ سنجوف؛ ماکێکی سپیە لە بەردی ئاهەک چێ دەکرێ.

▣ **آهک آبدیده** ☜ **آهک شکفته**

**آهک آب‌ندیده** ☜ **آهک زنده**

**آهک چارو** ☜ **آهک ساروج**

**آهک زنده**: ئاهەکی زیندوو؛ ماکێکی خۆگر و سپی ڕەنگە کە لە کوورەی ئاهەک‌پەزی ساز دەبێ و هێشتا ئاوی لێنەدراوە: **آهک نشکفته؛ آهک آب‌ندیده**

**آهک ساروج**: ئاهەکی ساروج؛ ئاهەکێ تێکەڵاو لەگەڵ خۆڵەمێش، زیخ یا خۆڵدا: **آهک چارو**

**آهک شکفته**: ئاهەکی کوشتە؛ تێکەڵاوی ئاو و ئاهەکی زیندوو: **آهک آبدیده؛ آهک کشته؛ آهک مرده**

**آهک کشته** ☜ **آهک شکفته**

**آهک مرده** ☜ **آهک شکفته**

**آهک نشکفته** ☜ **آهک زنده**

**سنگ آهک** ☜ **سنگ**

**آهک‌پز** / āhakpaz/، ـها؛ ـان/: *اسم*. ئاهەک‌پەز؛ کەسێ کە کاری پێژانی بەردە ئاهەک لە کوورەی ئاهەک‌پەزیدایە.

**آهک‌پزی** / āhakpazî/، ـها/: *اسم*. ئاهەک‌پەزی؛ کارگایەک کە بەردە ئاهەکی تێدا ئەپێژن تا ببێتە ئاهەک.

**آهک‌دهی** / āhakdehî/: *اسم*. *[کشاورزی]* ئاهەک‌دان؛ ئاهەک ماڵین؛ پژاندنی هێندێک ئاهەک لەسەر زەوی بۆ باشتر بوونی کشت و کاڵ.

**آهکدوست** / āhakdûst/، ـان/: *صفت*. *[گیاه‌شناسی]* ئاهەک‌خواز؛ گیای توانا بۆ گەشەکردن لە خۆڵی ئاهەکیدا. بەرانبەر: **آهک گریز**

**آهکرس** / āhakros/: *اسم*. گلاهەک؛ چەشنێ کوود کە لە تێکەڵاوی خۆڵ و ئاهەک ساز دەبێ.

**آهک‌گریز** / āhakgorîz/، ـان/: *صفت*. *[گیاه‌شناسی]* ئاهەک‌نەخواز؛ ئاهەک‌بێز؛ گیایەک کە لە خۆڵی ئاهەکیدا کز و سیس دەبێ. بەرانبەر: **آهکدوست**

**آهکی** / āhakî/: *صفت*. ئاهەکی؛ ئەهاکی؛ قسلی؛ قسری؛ کسلی؛ زقلی؛ کشلی ‹زمین آهکی؛ چشمەی آهکی: زەوی قسلی؛ کانیاوی ئەهاکی›.

**آهن** / āhan/: *اسم*. ئاسن؛ ئاهەن؛ ئاسنگ؛ ئاهێن؛ هەسن؛ ئێسن؛ هەسنگ؛ هاسن؛ هێسن: ۱. توخمێ کیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی۲٦ و کێشی ئەتومی ۵۵,۸٤، زۆر زوو ژەنگ دێنێ و لە پیشەسازی زۆر بە کار دەڕوا ۲. /ـها/ دەسهاتی ئاسنی؛ بەرهەمی هاسنی.

▣ **آهن تفته**: ئاسنی پۆلوو؛ ئاسنێ کە بە هۆی گەرم‌کردنی زۆرەوە سوور بۆتەوە و هەڵماسیوە.

**آهن جفت** ☜ **آهن شیار**

**آهن سپری**: ئاسنی سێ‌پەڕی؛ مێڵەی درووسکراو لە ئاسن وەکوو T.

**آهن سفید**: گاڵوانیزە؛ ئاسنی سپی؛ پۆڵای بە کانزای ڕۆح داپۆشراو.

**آهن شیار**: *[کشاورزی]* گاواسن؛ گاسن؛ گێسن؛ نووکی خیشەکە کە دەڕواتە ناو زەمینەوە و هەڵیدەدڕێ: **آهن جفت**

**آهن گالوانیزه**: گاڵوانیزە؛ ئاسنی سپی؛ پۆڵای بە کانزای ڕۆح داپۆشراو.

**آهن نبشی**: ئاهەنی نەبشی؛ ئاسنی دوو پاڵوو.

▣ **آهن سرد کوفتن**: *[کنایی]* ئاو کوتانەوە؛ با شەن‌کردن؛ ئاو خەست‌کردنەوە؛ ئاو هەس‌کردنەوە؛ ئاو لە دنگ کوتان؛ کاری

بێ‌هۆکردن.

**آهن کهنه به حلوا دادن:** *[کنایی]* مەلیچک بە قەناری گۆڕینەوە؛ کاری پڕقازانج کردن.

**آهن‌آلات** / āhanālāt'/: [فارسی/ عربی] /اسم. ئاسنەواڵە؛ دەسهاتگەلی ئاسنی (وەکوو تیرئاسن، نەبشی و...) ‹بهای آهن‌آلات در هفته‌ی گذشته ترقی کرد: نرخی ئاسنەواڵە حەوتەی پێشوو چووە سەرەوە›.

**آهن‌پاره** / āhanpāre'، ـها/: اسم. ۱. ئاسنەلەتە؛ کوتەئاسن ‹اتومبیل به صورت آهن‌پاره درآمده بود: ماشینەکە وەکوو ئاسنەلەتەی لێ‌هاتبوو› ۲. *[مجازی]* قوڕازە؛ کانزای بێ‌بایەخ، شکاو یا لە کار کەوتوو ‹بابت این آهن‌پاره پول هم می‌خواهی؟: لە باتی ئەم قوڕازانە پارەیشت ئەوێ؟›.

**آهنجش** / āhanceš'/: اسم. *[فلسفه]* لاکردن؛ کردنەلاوە؛ هەلاوێری؛ هەڵوەژێری؛ لە باقی جوێ‌کردنەوە.

**آهنجیدن** / āhancîdan'/: مصدر متعدی. *[قدیمی]* هەڵوەژارتن: ۱. هەلاواردن؛ لێک جیاکردنەوە؛ لە یەک کێشانەوە؛ لێک گرتنەوە ۲. بە چەشنی جیا لە باقی ڕەچاوکردن ۳. هەڵێنجان؛ هەڵهێنجان؛ هینجان؛ هێنجان؛ لە باقی جیاکردنەوە ‹تُرُب را بکوبد و آب وی بیاهنجد: ترپ بکوتێتەوە و ئاوەکەی هەڵینجێنێ›.

■ صفت مفعولی: **آهنجیده** (هەڵوەژارتوو)

**آهنربا** / āhanrobā'، ـها/: اسم. هەسن‌فڕێن؛ ئاسن‌کێش؛ مەگەن؛ موغناتیز؛ کانزایەک کە ئاسن بەرەو خۆی دەکێشێ: **مغناطیس**

**آهنربایی** / āhanrobāyî'/: صفت. ئاسن‌کێشی؛ هەسن‌فڕێنی؛ بە تایبەتمەندی ئاسن‌کێشیەوە ‹میله‌ی آهنربایی: مێڵەی هەسن‌فڕێنی›.

**آهن‌فروش** / āhanfurûš'، ـها؛ ـان/: اسم. ئاسن‌فرۆش؛ ئاهەن‌فرۆش؛ فرۆشیاری دەسهاتی ئاسنی (وەکوو تیرئاسن، مێلگرد). هەروەها: **آهن‌فروشی**

**آهنکار** / āhankār'، ـها؛ ـان/: اسم. *[نامتداول]* ئاسنگەر؛ هەسنکار؛ ئاسنکار؛ هەسنکەر؛ هەسنگر؛ ئاهێنگەر؛ وەستاخاڵە.

**آهن‌کشی** / āhankešî'/: اسم. ئاسن‌کەشی؛ جۆشدانی مێلە و تەسمەی ئاسنی لە ژێر و لاپاڵی ماشێن یان ئامرازی شکاو، بۆ دروست و قایم‌کردنەوەی.

**آهنکوب** / āhankûb'، ـها؛ ـان/: اسم. ئاسنگەر؛ هەسنکەر؛ هەسنگر؛ ئاهێنگەر؛ وەستاخاڵە؛ وەستای ئامرازی ئاسن.

**آهنکوبی** / āhankûbî'/: اسم. ۱. ئاسنگەری؛ هەسنکەری؛ هەسنگری؛ ئاهێنگەری؛ پیشەی ئاسنگەر ۲. ئاسن‌کەشی.

**آهنگ** / āhang'/: اسم. ۱. /ـها/ ئاهەنگ؛ نەوا؛ هەوای ستران؛ مەقام؛ مقۆم؛ هەوای گۆرانی؛ بەشێ لە مووسیقا کە مووسیقاڕ دروستی کردووە ‹آهنگ شهرزاد: ئاهەنگی شەهرزاد› ۲. دەنگ؛ چۆنیەتی دەنگ یان سۆز ‹آواز دادنش آهنگی آمرانه داشت: بانگ‌کردنی دەنگێکی میرمەزانەی بوو› ۳. /ـها/ هەوا؛ بەزم و ئاهەنگ ‹آهنگ رقص: بەزمی هەڵپەڕکێ› ٤. *[ادبی]* نیاز؛ ویست؛ ئاهەنگ؛ خەیاڵ لە کردنی کارێک ‹آهنگ رفتن کرد: ئاهەنگی ڕۆیشتنی‌کرد› ٥. نرخ؛ هەوا؛ نرخی جێبەجێیی یان گۆڕانی شتێ لە ماوەیەکی دیاریکراودا ‹آهنگ رشد: نرخی پەرەسەندن›.

▣ **آهنگ شاد:** ئاهەنگی کرژ.

**آهنگ عزا:** ئاهەنگی ماتەم.

**آهنگر** / āhangar'، ـها؛ ـان/: اسم. ۱. ئاسنگەر؛ ئاهێنگەر؛ هەسنکەر؛ هەسنگر؛

ئاسنکوت؛ وەستاخاڵە؛ خاڵە؛ هۆستای هەسنان؛ وەستای ئامرازی ئاسن ۲. جۆشکار.

**آهنگرخانه** / āhangarxāne'، ـها/: اسم. [قدیمی] ئاسنگەری؛ ئاهەنگەری؛ ئاسنکارخانە؛ کارگای ئاسنگەری.

**آهنگری** / āhangarî'/: اسم. ئاسنگەری؛ ئاهەنگەری؛ ئاهێنگەری: ۱. کاری ئاسنگەر ‹شوهرش آهنگری می‌کند: شووەکەی ئاسنگەری دەکات› ۲. /ـها/ کارگای ئاسنگەری ‹در آهنگری کار می‌کند: لە ئاسنگەری کار دەکات›.

**آهنگساز** / āhangsāz'، ـها؛ ـان/: اسم. مووسیقارِ؛ نەواچی؛ ئاهەنگساز؛ دەنگ‌نقیس؛ ئاوازدانەر؛ بەستەکار؛ هەوای ستران ڕێکخەر ‹علی مردان آهنگساز نامداری بود: عەلی مەردان مووسیقارێکی بەناوبانگ بوو›.

**آهنگسازی** / āhangsāzî'/: اسم. مووسیقارِی؛ ئاهەنگسازی: ۱. کار یان ڕەوتی ڕێکخستنی هەوای ستران ‹آهنگسازی نوار خیلی عالی بود: مووسیقاری شریتەکە زۆر باش بوو› ۲. پیشەی مووسیقارِ ‹آهنگسازی برای آدم نان نمی‌شود: مووسیقاری نابێتە نان و ئاو بۆ کەس›.

**آهنگین** / āhangîn'/: صفت. نەزمین؛ ئاهەنگین؛ خۆش‌ئاهەنگ ‹کلام آهنگین: قسەی نەزمین›.

**آهنی** / āhanî'/: صفت. ۱. ئاسنی؛ ئاسنگی؛ ئاهەنی؛ ئاسنین؛ ئاهێنی؛ هەسنی: چێ بوو لە ئاسن ‹میز آهنی: مێزی ئاسنی› ۲. [مجازی] کانزایی ‹چیز آهنی: شتی کانزایی›.

**آهنین** / āhanîn'/: صفت. [ادبی] ۱. ئاسنین؛ ئاسنی؛ ئاسنگی؛ ئاهەنی؛ ئاهێنی ۲. [مجازی] پۆلایین؛ زۆر سەخت؛ پتەو ‹ارادهٔ آهنین: ویستی پۆلایین›.

**آهنین‌بازو** / āhanînbāzû'، ـان/: صفت. [ادبی] باهۆپۆلایین؛ گورد؛ خاوەن باهۆیەکی زۆر بەهێز. هەروەها: **آهنین‌پنجه**؛ **آهنین‌چنگال**

**آهو** / āhû'، ـها؛ آهوان āhovān/: اسم. ئاسک؛ مامز؛ کارمامز؛ مامبز؛ ئاهوو؛ ئاهی؛ خەزال؛ خەزال؛ کەژاڵ؛ کەژۆڵ؛ غەزاڵ؛ مەراڵ؛ مەبرە؛ جەیران؛ گیاندارێکی گوانداری گیاخۆری جووت سمە، بە قەد بزنێک دەبێ، دەست و پێی بڵند و باریک و لەشی کەم‌تووکە.

▣ **آهوی خُتَن** ☜ **آهوی مُشک**

**آهوی مشک**: ئاسکی موشک؛ ئاسکێکی چکۆلەی بەرزایەکانی سیبری، ساخالین و هیمالیایە، بە مووی قاوەیی و زبرەوە، کە لە ناوکی موشک دەگرن: **آهوی خُتَن**

**آهوبره** / āhûbar(r)e'، ـها؛ ـگان/: اسم. کارمامز؛ کارمامبز؛ کارخەزال؛ ئاسکۆلە؛ بەچکە ئاسک.

**آهوپا** / āhûpā'، ـها/: اسم. [معماری] موقەرنەس؛ ژێرتاق؛ نەخشێکی تایبەت بە ژێرتاق و پاڵ دیوارە، وەکوو نیو جەغزی لەسەریەک کەوتوو وایە.

**آهوچشم** / āhûčešm'، ـها؛ ـان/: صفت. [کنایی] چاوکەژاڵ؛ چەم‌کەژەڵ؛ چاوبەلەک؛ خاوەن چاوێکی درشت و کێشراوە وەکوو چاوی ئاسک.

**آه و ناله** / āh-o-nāle'، ـها/: اسم. [کنایی] ئاهـ و ناڵە؛ نزوولە؛ نکوناڵ؛ گریان و هاوار، بەتایبەت بە هۆی ئێش یان خەفەتەوە.

**آهیانه** / āh(i)yāne'، ـها/: اسم. لا تەوێڵ؛ هەر کام لە دوو ئێسکی لاپاڵی تەوێڵ.

**آهیختن** / āhîxtan'/: مصدر. متعدی. [ادبی] ۱. دەرهێنان؛ دەرکێشان؛ بەرکێشتەی ۲. بلیندکردن؛ بەرزکردنەوە؛ هۆربڕنەی.

■ صفت مفعولی: **آهیخته** (دەرکشاو)

**آهیخته** / āhîxte'/: *صفت. [ادبی]* کشاو؛ دەرکشاو؛ دەرکێشراو؛ دەرهاتوو لە کالان.

**آی** [1] / āy'/: *حرف. [گفتاری]* ئای؛ ئەی؛ وشەی نیشاندانی زۆر و زەوەندی ‹آی خندیدیم!: ئای پێکەنین!›.

**آی** [2]: *صوت.* ١. ئەهای؛ ئوهۆ؛ های؛ هۆی؛ هۆ؛ گەلۆ؛ وشەیەک بۆ بانگ کردن یان هەڕەشەکردن ٢. ئای؛ ئاخ؛ ئۆف؛ وەی؛ وشەیەک بۆ نیشاندانی ئێش ‹آی سَرم؛ آی مُردم: ئای سەرم؛ وەی مردم› ٣. ☜ **آخ**

**آیا** / āyā'/: *قید.* ئایا؛ ئایاکوو؛ ئاخۆ؛ ئاخوا؛ داخۆ؛ داخوم؛ داخوا؛ ئەرێ؛ هەیاران؛ وشەی پرسیار کە زۆرتر لە نووسیندا بە کار دەڕوا ‹آیا می‌دانی؟: ئاخۆ ئەزانی؟›.

**آیات** / āyāt'/: [عربی] ١. جمعِ ☜ **آیه** ٢. جمعِ ☜ **آیَت**

**آیت** / āyat'، ـها؛ آیات/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* نیشانە؛ گەوای شتێ ‹آیتِ حُسن: نیشانەی باشی›.

**آیت‌الله** / āyatollāh'، ـها/: [عربی]/*اسم.* ئایەتوڵڵا؛ نیشانەی خودا (نازناوێکە بۆ زانای ئایینی هەرە گەورەی موسڵمان).

**آیروسل** / āyrosol'/: [فرانسوی]/*اسم.* ١. تەم؛ هەورێک لە ڕێزەگەلی جۆراوجۆر لە ناو هەوادا ٢. پژە؛ دووکەڵ؛ پژەک؛ پژێنە؛ ماکێکی (وەکوو ئۆدکولۆن) کە وەک پژگە لە دەفری تایبەتی خۆیەوە ئەپژێتە دەر ٣. /ـها/ پژانە؛ دەفری پژەک * **افشانه؛ اسپری**

**آیروگرام** / āyrog(e)rām'/: [انگلیسی]/*اسم.* ئایرۆگرام؛ نامەی پۆستی هەوایی؛ چەشنێ قاقەزی ناسک کە دوای دەق کردن وەکوو پاکەتی پوستی لێدێ و بۆ نووسینی نامەی هەوایی بە کار دەڕوا.

**آیرومتر** / āyrometr'، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* هەواپێو.

**آیزنه** / āyezne'، ـها/: [ترکی]/*اسم.* شووی خوشک؛ زاوا؛ زاما؛ زاقا؛ زەما؛ یزنە: **یَزنه**

**آی. سی. یو.** / āy.sî.yû'/: [انگلیسی]/*اسم.* ئای.سی.یوو؛ جێگەی ئاگاداری تایبەت لە نەخۆشخانە، بۆ نەخۆشی دڵ.

**آیش** / āyeš'/: *اسم.* ١. شێوەرد؛ شێف؛ شوو؛ شووم؛ شوومی؛ زەمینی کشتوکاڵ کە بۆ ماوەیەک ناکێڵدرێ، تا خاکەکەی بەهێز بێتەوە ٢. کار یان ڕەوتی هێشتنەوە و نەکێلانی زەوی، بۆ قەوەت گرتنی.

**آیش‌بندی** / āyešbandî'، ـها/: *اسم.* ١. شێف و وەرز؛ دابەش کردنی زەمینی کشتوکاڵ بە شێوەیەک کە ئەبێ هەر ساڵ چەندی شێف بێ و چەندی بکێڵدرێ ٢. شێفدانان؛ وێڵ کردنی بەشێ لە کێلگە بە شێفی.

**آیفن** / āyfon'، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* ئایفۆن؛ نێوی بازرگانی ئامرازێکی کارەبایی بۆ ناسینی کەسێ کە لە دەرکە دەدا و کردنەوەی دەرگا، بە بێ ئەوەی بچیە پشتی دەرکەوە ‹از پشت آیفن صدایش را شناختم: لە پشت ئایفۆنەکەوە دەنگیم ناسی›.

**آی. کیو.** / āy.kiyû'، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* ئای.کیوو؛ بەشە هۆشی؛ هۆشبەرە.

**آیمارا** / āymārā'/: *اسم.* ئایمارا: ١. هۆزێک لە خەڵکی سوورپێستی سەر بە وڵاتانی پیرۆ و بوولیڤی ٢. /ـها/ هەرکام لەو هۆزە ٣. زمانی ئەو هۆزە.

**آیم‌سایم** / āyam.sāyam'/: *قید. [گفتاری]* ١. گاگا؛ جارجار؛ گاف‌گاف؛ جاروبار ‹آیم‌سایم سری به مسجد می‌زد: گاگایەک ڕێی لە مزگەوت ئەکەوت› ٢. بەهەڵکەوت؛ تەکوتووک؛ بەدەگمەن؛ تاکوواز ‹مگر آیم‌سایم راه گم کند و این طرفها بیاید: مەگەر بەهەڵکەوت پای هەڵکەوێ و بێ بۆ ئێرە›.

**آیندگان** / āyandegān'/: *ضمیر.* داهاتوان؛

نـەهـاتوان؛ کـەسـانیٚ کـە لـە داهـاتوودا لـەم دنیایە دەژین.

**آیندوروند** / āyand-o-ravand'، ـهـا:/اسم. [گفتاری] هـاتوچـۆ؛ هـاتوچـوو؛ ئامـشۆ؛ ئامشۆ- ڕەفت؛ ئاماولوەی ‹روزهای جمعه آیند و روند ما زیاد است: ڕۆژانی هـەینی هاتوچووی ئیمە زۆرە›.

▣ **آیندوروند داشتن:** بـە ئامـشۆ- ڕەفـت بوون؛ بە هاتوچۆ بوون ‹سالهاست که با آنها آیند و روند نداشتەایم: چەنای چەن ساڵە لەگەڵ ئەواندا ئامشو-ڕەفتمان نەبووە›.

**آینده** / āyande'/:اسم. داهـاتوو؛ بانـان؛ هالـەڕیٚ؛ ئـیٚ؛ ئاینـدە: ۱. ئایـەنـە؛ ئاینـە؛ چـەوما؛ چـەودما؛ دوارۆژ؛ پاشـەڕۆژ؛ لـەوەدوا؛ لـەمـەبـەولا؛ ڕۆژانی دوایی؛ سـەردەمـی دوای ئیٚستا ۲. بـەرجـەوەنی ویٚچـوونی بـاش بـوون و پـەرەسـاندن لـە دوارۆژدا ‹ایـن مغازە آیندەاش خـوب اسـت: ئـەم دووکانـە داهـاتووی باشـە› ۳. بـەسـەر بـردنی ژیـان یـان سـەرکـەوتـن لـە سالانی دوایـیدا ‹مـی‌خـواهم آینـدەات تـأمین بـشود: دەمـەویٚ داهـاتووت دابـین بیٚـت›. هـەروەهـا: **آینده داشتن**

**آیندەساز** / āyandesāz'، ـان/: صفت. داهاتووساز؛ ئایندەساز؛ هـۆی دابـین بـوون و چـاکتر بـوونی بـارودۆخی داهـاتوو ‹جـوان آیندەساز: گەنجی داهاتووساز›.

**آیندەشناسی** / āyandešenāsî'/:اسم. داهاتووناسـی؛ ئاینـدەناسـی؛ لقـیٚ لـە زانـستگەلی ئـاپۆرەیـی کـە سـەبـارەت بـە بـارودۆخی زانـستی، ئـابووری و پیـشەیـی ولاتان لیٚدەکۆڵیٚتەوە.

**آیندەنگری** / āyandenegrî'، ـهـا:/اسم. دوورنـواڕی؛ دووربـینی؛ کـار و ڕەوتی پـیٚش‌بـینی و ڕیٚـک‌وپیٚـک‌کـردنی بـەرنامـەی پیٚویست بۆ داهاتوو.

**آینو** / āynû'/:اسم. ئاینوو: ۱. هـۆزی سـپی پیٚـستی نیـشتەجـیٚ لـە بـاکووری ژاپـۆن، دوورگـەگـەلی ساخالـین وکوریـل ۲. /ـهـا/ هەرکام لەو کەسانە ۳. زمانی ئەو هۆزە.

**آینه**[1] / āyne' ☜ **آیینه**

**آینه**[2]: صفت. لار؛ گیٚـڕ؛ ڕاسـت ڕانـەوەسـتاو (بـە تایبەت بۆ جک و قاپ).

**آیە** / āye'، ـها؛ آیات:/ [عربی]/اسم. ئایە؛ هـەر کام لـەو بـەشانەی قورئـان کـە ژمـارەیـەکـی تایبەت بە خۆی هەیە.

▣ **آیـەی یـأس خوانـدن:** [مجـازی] قـسەی ساردکردن؛ بە ناهومیٚدی قسەکردن.

**آیەومایه** / āye-vo-māye'/: [؟ فارسی]/اسم. [مجازی] پاک؛ سەروبەر؛ گش‌لەگش.

**آیین** / āyîn'، ـهـا:/اسم. ۱.ئاکـار؛ ڕەوشـت ‹آیـین جـوانمردی؛ آیـین پهلـوانی: ئاکـاری جـوامیٚری، ئاکـاری پالـەوانی› ۲. دیـن؛ ئـایین؛ ئـاین؛ ڕەوشـت؛ ئـۆل ‹آیـین اسـلام: ئایینـی ئیـسلام› ۳. شـیٚواز؛ زیٚ؛ ڕەوشـتی کـار ‹آیـین نگـارش؛ آیـین سـوارکاری: شـیٚوازی نووسـین؛ شـیٚوازی سـوارکاری› ٤. ڕیٚوڕەسـم؛ ئاهـەنـگ ‹آیین حج: ڕیٚوڕەسمی حەج› ❋ **آئین**

▣ **آیین مدرسی:** ۱. ئـامۆژەگـەلی ئـایینی و فەلـسەفی زاڵ بـە سـەر ئۆرووپـای ڕۆژئـاوادا، دەنیٚـوان سـالانی ۱۰۰۰ تـا ۱۵۰۰ی زایینی ۲. کۆنەپەرسـتی؛ پـاداگری لـە سـەر وانە و شیٚوازگەلی کۆنەی پیٚشووەکان.

**آیین‌بندی** / āyînbandî'، ـهـا:/اسم. ۱. ڕازاندنەوە (بە گوڵ و چـرا بـە مـەبـەسـتی جـەژن و شادی) ۲. ئایەنەکاری ❋ **آئین‌بندی**

**آیین‌نامه** / āyîn.nāme'، ـهـا:/اسم. دەسـتووری حکوومـەتی؛ قانوونگـەلیٚک کـە لـە لایەن بـەرپرسـانی حکوومـەتـەوە دادەمـەزریٚ و دەبیٚ بەڕیٚوە بچیٚ.

**آیینه** / āyîne'/:اسم. ۱. /ـهـا/ ئاویٚنـە؛ ئاوینـە؛

هاوێنــه؛ جــام؛ جامــەک؛ قــۆدی؛ قودیــک؛ مریــک؛ گزگــی؛ گــوزگی؛ گــوزین؛ هیلــی؛ هێلی؛ نـەینـووک؛ نۆینـک؛ نـەنیـک؛ نـەینـک؛ نـەینـۆک ٢. /ـها//*فیزیک/* جام؛ هـەر شـتێ ســاف، کــوورِ یــان قــووڵ کــە ئاشــۆپ یــان وێنـــەیـــەک نیـــشان بـــدات ٣. */مجـــازی/* ڕۆشـــنایی؛ ڕوونـــاکی؛ شـــتی خـــاوێن و ڕوون ‹آیینـــەی آب؛ آیینـــەی آسـمان: ئاوێنـــەی ئـــاو؛ ڕۆشنایی ئاسمان› ❋ **آئینه؛ آینه**

▣ **آیینــەی بخــت**: ئاوێنـــەی بـــەخـــت؛ ئاوێنەیەک کـە لـە زەمـاوەنـدا بـەرانبـەر بـە بووکی دادەنێن.

**آیینەی تال**: ئاوێنەی حەڵەبی.

**آیینەی تخت**: ئاوێنەی تەخت؛ ئاوێنەی ساف.

**آیینــەی چینــی**: */قـدیمی/* ئاوێنـــەی چـــینی؛ ئاوێنەی دروستکراو لە پۆڵای بریقەدار.

**آیینەیدق**: ١. ئاوێنەی شێت؛ ئاوێنەیەک کـە باش ساف نەبووبێ و وێنـە و ئاشـۆپ خـراپ نیـشان بـدا ٢. */مجازی/* داگـیراو؛ داهێـزراو؛ پـەژمـەراو؛ داچـەکـاو؛ مـرۆی خـەمگـین و بێدەنگ داکەوتوو.

**آیینەی سوزان**: ئاوێنـەی کـوورِ، ئاوێنـەیـەک کە تیشکی تاو خـرِ دەکاتـەوە سـەر خاڵـێک و لە هەرچی بدا دەیسووتێنێ.

**آیینـەی قـدی**: ئاوێنـــەی قـــەدی؛ ئاوێنـــەی بالا پیاو.

**آیینـــــەی کـــــاو**: ئاوێنـــــەی قـــــووڵ؛ ئاوێنــەیــەک کــە نــاوەکــەی قووڵــە و وێنــە و ئاشــۆپ ئــەگــەر زۆر لــێ نزیــک بــێ گــەورەی دەکاتـــەوە و زۆریـــش لـــێدوور بـــێ پچـــووک نیـــشانیدەدا: **آیینــــەی مقعّر**

**آیینەی کـروی**: ئاوێنـەی خـرِ؛ بـەشـێ لـە گۆیـەک کـە دەرەوە یـان نـاوەوەی وەکـوو ئاوێنەی لێهاتبێ.

**آیینـەی کـوژ**: ئاوێنـەی کـوورِ؛ ئاوێنـەیـەک کـە قوتـە و وێنـە یـان ئاشـۆپ، چکۆلـەتـر نیشان دەدات: **آیینەی محدّب**

**آیینەی محدب** ☜ **آینەی کوژ**

**آیینەی مقعر** ☜ **آیینەی کاو**

**آیینــــەبنــــدان** / āyînebandān /ʹ: */اسـم. [ادبـی]/* ئاوێنــەبــەنـدان؛ کــار یــان ڕەوتی ڕازاندنــەوەی جێگایــەک بــە ئاوێنــەی جۆراوجــۆر (زۆرتــر بــۆ جێژن و شادی).

**آیینـــــەخانـــــه** / āyînexāne ,ʹ ـهـــا/: */اســم.* ئاوێنەبەند؛ جێگایەکـی سـەرداپۆشـراو کـە دەر و دیواری بە ئاوێنە ڕازاوەتەوە.

**آیـیـنـــــــەدار** / āyînedār ,ʹ ـها؛ ـان/: */اسـم.* ئاوێنــەدار؛ کـەسـێ کـە پێـشووتر ئاوێنــەی لـە گەڕەک دەگێڕا، پارەی لە خەڵـکی دەسـتاند تـا خۆیان تەماشا کەن.

**آیینـــــەداری** / āyînedārî /ʹ: */اســم. [قــدیمی]/* ئاوێنەداری؛ کار یان پیشەی ئاوێنەدار.

▣ **آیینەداری در شهر کـوران**: */کنایی/* بلـوێر بـــۆ کـــەرِ لێـــدان؛ کـــاری بێهـــوودەکـــردن، بەتایبـەت نوانـدنی هونـەر بـۆ کـەسـانێ کـە ئاگایان لێ نیە و هیچ تێناگەن.

**آیینـــــەکـــار** / āyînekār ,ʹ ـهـا؛ ـان/: */اسـم.* ئاوێنەکار؛ کەسێ کە کـاری خـەملانـدنی مـاڵ و بینا بە کۆمەکی ئاوێنەیە.

**آیینـەکـاری**/ āyînekārî /ʹ: */اسم.* ئاوێنـەکـاری: ١. کـــار یـــان ڕەوتی ڕازاندنـــەوەی جێگایـــەک بە ئاوێنە ٢. /ـها/ نەخـش و نیگارێـک کـە بـەم شێوازە دروست کـراوە ‹تمام دیوارها آیینـەکـاری بود: تەواوی دیوارەکان ئاوێنەکاری بوو›.

**ـآیینـی** / āyînî /ʹ: *پیواژە.* ـئـایینی؛ سـەر بـە ئایین: **ـآئینی**

**آی.یـو.دی.**/ āy.yû.dî ,ʹ ـها/: [انگلیسی] */اسم. [پزشکی]/* کەرەسـەیـەک کـە ژن هـەڵـیدەگـرێ بۆ بەرگری لە ئاووس بوونی.

# ا

**ا¹** / 'a /: *حرف.* پیتی سەرەتایی ئەلفوبێتکەی فارسی، کە لە سەرەتای وشەدا بە سێ شێوەی «اَ»،«اِ»،«اُ» دەخوێنرێتەوە.

**ا²**: *صوت. [گفتاری]* ئا؛ تەح؛ تەحا؛ ئەک؛ پەح؛ دەک؛ وتەی سەیرمان وێڕای ئافەرین ‹ ا! اینهمه پول گرفتی؟: تا! ئەم گشتە پارەیەت وەرگرت؟›.

**ا** / 'e /: *صوت. [گفتاری]* ئەی؛ ئێ: ١. نیشانەی سەمەرەیی ‹ اِ! این که خالی است: ئەی! ئەمە خۆ خالیە ٢. نیشانەی ناڕەزایی ‹ اِ! بس کن دیگر: نەی! بەسیە ئیتر›.

**ا** / 'o /: [فرانسوی] *اسم. [پزشکی]* ئۆ؛ گرۆیەکی خوێنی.

**ا** / 'o: /: *صوت. [مخفف]* ئوهۆی؛ ووو؛ هۆ؛ ئۆ؛ هۆی؛ دەنگی دڵگرانی و عاجزی دەربڕین ‹اِ! چکار می‌کنی؟: ئوهوی! چدەکەی؟›.

**ائتلاف** / 'e'telāf، ـها؛ ـات /: [عربی] *اسم.* یەکگری؛ هەڤبەندی: ١. *[نامتداول]* سازگاری؛ سازشت؛ پێکهاتوویی؛ تەبایی؛ تەڤایی ٢. *[سیاسی]* هاوپەیمانی؛ هاوکاری دوو یا چەند دەستە یا بەستەی ڕامیاری و هاویاری، بۆ دابین بوونی ئامانج یان بەڕێوەبردنی بەرنامەگەلی دیاریکراویان، هاوڕێ لەگەڵ پاراستنی پەسار و بەندەنەی خۆیان. هەروەها: **ائتلاف کردن**

**ائتلافی** / 'e'telāf /ī: [عربی] *صفت.* هاوپەیمانی؛ هاوپەیمانیەتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە هاوپەیمانیەتیەوە.

**ائمه** / 'a'emme /: [عربی] جمعِ ☜ **امام**

**ائوسن** / 'e'osen /: [؟] *اسم.* ئیئۆسێن؛ دووهەمین خول لە دەورانی سێهەمی زەوینناسی.

**ابا** / 'ebā /: [عربی] *اسم. [ادبی]* دووری؛ خۆبوێری؛ خۆپارێزی؛ خۆلادەری؛ ملنەدەری؛ ڕەوتی خۆ پاراستن لە جێبەجێ‌کردنی کارێ یان بەجێ‌هێنانی ئەرکێک.

⊡ **ابا آوردن** ☜ **ابا داشتن/ کردن**

**ابا داشتن/ کردن:** *[ادبی]* قەبووڵ نەکردن؛ دووری کردن؛ نەپەزێران؛ خۆ پاراستن؛ خۆ پارێزان: **ابا آوردن**

**ابابیل** / 'abābîl، ـها /: [معرب از ؟] *اسم. [نامتداول]* پەڕەسێلکە؛ پلیزری؛ پلیزرگ؛ پلیزر؛ پلیسری؛ پلیسرگ؛ پلیزگردە؛ دویل مقەس؛ کاردە پەلە؛ پەلەوەرێکی باڵ باریکی دەنووک کورتی کلک وەک مقەستی، کۆچەرە.

**اباحـــه** / ebāhe'/: [عربـــی]/*اسـم.* ڕەوایـــی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕەوا بوون.
**اباطیل** / abātîl'/: [عربی]/*اسـم.* هەڵیتوپەڵـیت؛ هیچوپووچ؛ هەڵیانوپەڵیان؛ هەلـەق‌ـمـەلـەق؛ هەڵەمەڵەق؛ هاتەران‌ـپاتـەران؛ هـەلـەوشـاش؛ قسەی بێتەرز و ڕێز؛ وتەگەلی بێمانا و بێهۆ.
**ابتـــدا**[1] / ebtedā'/: [عربـــی]/*اسـم.* ســـەرەتـــا؛ هەوەڵ؛ ئەوەڵ؛ بەرایـی؛ بـەراهێـک؛ دەسـپێک؛ بەلەبوورە ‹ابتدای کتاب: سەرەتای کتێب›.
**ابتـدا کـردن:** دەسـت پێکـردن؛ دەسـپێکردن؛ دەسپەنەکەردەی.
**ابتـدا**[2]: *قید.* سـەرەتـا؛ لـە هـەوەڵا؛ ئـەوەڵ؛ وەڵێنە؛ هەوەڵ؛ لـەبـەرا؛ لـە سـەرەتـاوە ‹ابتدا او آمد: سەرەتا ئەو هات›.
**ابتـــداً** / ebtedā'an'/: [عربـــی] *قیـد. [ادبـی]* لـە سەرەتاوە؛ لە سەرەتا؛ سەرەتـا؛ لـە هـەوەڵا؛ بـەر لە هەموو شتێ؛ پـێش هـەمـوو شـتێ؛ ئـەوەڵای ئـەوەڵ؛ پێـشەکـی ‹ابتـداً بایـد ثابـت کـرد: لـە سەرەتاوە دەبێ بیسەلمێنین›: **ابتدائاً**
**ابتدائاً** / ebtedā'an'/: [عربی] ☜ **ابتداً**
**ابتدائی** / ebtedā'î'/: [عربی] ☜ **ابتدایی**
**ابتـــدا بـــه ســـاکن**[1] / ebtedābesāken'، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی/ عربـی] *صفت. [دستور]* کپـی لـە بڕگـەی هـەوەڵـدا (سـەبارەت بـە وشـە) زمـانی فارسـی قاڵـبی وای نیـە، بـەڵام لـە کوردیـدا زۆرە، وەک: سست، کش، مشت، بڵند.
**ابتدا به ساکن**[2]: *قید.* لـە پڕ؛ لـە ناکـاو؛ لـەنکـاو؛ گز؛ گزومەت؛ ژگرڤـە؛ ژنشکێـڤە ‹ابتـدا بـە سـاکن شروع کرد بـە بـد گفتن از رزونامـەهـا: لـە پڕ دەسـی کرد بە هەڵشاخان بە ڕۆژنامەکاندا›.
**ابتـــــدایی** / ebtedāyî'/: [عربـــــی] *صـــــفت.* ســـەرەتـــایی: ١. بـــەراهـــی؛ دەســـپێکی؛ پێوەندیدار یان سـەربـە سـەرەتـا یـا هـەوەڵـین قۆنـــاغ ‹مدرســـەی ابتـــدایی: خوێندنگـــەی سەرەتـایی› ٢. *[مجازی]* دواکـەوتـوو؛ ڕەمـەکـی؛ بـێئـەزمـوون؛ وەک سـەرەتـا مانـەوە ‹زنـدگی ابتدایی: ژیانی سەرەتایی› ❋ **ابتدائی**
**ابتــذال** / ebtezāl'/: [عربـی]/*اسـم.* بـێنرخـی؛ تەوەشـی؛ بـار و دۆخ یـا چۆنیـەتی بێفـەڕی و سووکی؛ پڕ لـە بـاری نالـەبـاری، بـێ کـەڵـکی و پڕپەڵەیی.
**ابتـر** / abtar'/: [عربـی] *صفت. [ادبی]* ١. لنگـەر؛ عـەلـەمیـار؛ عـەلـەمـدار؛ قـۆپ؛ نیـڤەڕۆ؛ دویلکبڕی؛ یەوکـشت؛ قـەرەت؛ ناتـەواو؛ قـسر؛ دوابڕاو ٢. خراو؛ خراپ؛ خرا؛ تەفر و توونا.
**ابتکـار** / ebtekār'، ـهـا؛ ـات/: [عربـی]/*اسـم.* نوێکـاری: ١. ڕەوشـتێکی تـازە و نـوێ بـۆ جێبـەجـێ کـردنی کارێـک ‹استفاده از لامـپ روشـنایی بـرای گـرمکـردن کرسـی، ابتکـار او بـود: کەڵـک وەرگـرتن لـە گولـۆپ بـۆ گـەرمکردنـەوەی کورسـی، نوێکـاری ئـەو بـوو› ٢. کارێـک کـە بـە بـارێکی نـوێ و جـوان دەکـرێ ‹او در فـروش کتـاب ابتکـار جـالبی داشـت: لـە فرۆشـتنی کتێبـدا نوێکاری باشی هـەبوو› ٣. بـیر و ڕەوشـتی نـوێ لە کار و بـاردا ‹انسان بایـد در کـارش ابتکـار داشـته باشد: مرۆ دەبێ لە کاریدا نوێکاری هەبێ›.
▣ **ابتکار عمل:** توانایی ئـەنجامـدانی کارێـک بـە ویست و شێوازی ڕەچاوکراوی تایبەت بە خۆ.
**ابتکـــــاری** / ebtekārî'/: [عربـــــی] *صـــــفت.* نوێکارانـــە ‹روشـــهای ابتکـــاری: ڕەوشـــتگەلی نوێکارانە›.
**ابـــتلا** / ebtelā'، ـهـا؛ ـات/: [عربـی]/*اسـم.* ١.کـارەڕەهـاتی تـووش بـوون؛ تێـوەگـلان؛ تـێئالیـان؛ گـرتن؛ تووشـی نـەخۆشـی یـان ناخۆشـی هـاتن ٢. *[نامتداول]* بـار یـا چۆنیـەتی بە سەردا هاتنی بەڵا و چورتم.
**ابتهـــاج** / ebtehāc'/: *اسـم. [ادبـی]* خۆشـی؛ خوەشی؛ وەشی؛ شادی؛ شادمانی؛ شایی.
**ابتیـــاع** / 'ebtiyā' /: [عربـــی]/*اســـم. [ادبـــی]* کڕیاری؛ سێنیاری.

⊡ **ابتیاع شدن**: سنیان؛ سەنیان؛ کڕدران؛ ئەسنیەی ‹کالاها خیلی زود ابتیاع شدند: کەلپەلەکان خێرا کڕدران›.

**ابتیاع کردن**: سەنسدن؛ سەنین؛ کڕین؛ خەڕین؛ سانەی؛ ئەستەی.

**ابجد** / 'abcad/: [عربی] *اسم*. ۱. ئەبجەد؛ ناوی جۆرێ ئەلفوبێتکەی مێژینەی عەرەبیە کە بە ئەبجەد دەست پێدەکا و هەر پیتێک ژمارەیەکی هەیە و حیساباتی پێدەکرێ ۲. ☜ حساب ابجد، **حساب**

**ابجدخوان** / 'abcadxān، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم*. *[ادبی]* نۆمس؛ نۆئامۆژ؛ کەسێ کە تازە خوێندن و نووسین دەست پێدەکا.

**ابخره** / 'abxere/: [عربی] جمعِ ☜ **بُخار**

**ابد**[1] / 'abad/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* هەتا؛ ئەبەد: ۱. کۆتایی جیهان؛ ئاکامی دنیا ‹از ازل تا ابد: لە سەرەتا تا هەتا› ۲. *[مجازی]* بێبڕانەوە؛ بێپسانەوە؛ تاهەتا؛ هەتاـهەتا؛ نەڤەبڕی؛ بێبڕانەوەی دەم و کات؛ هەتاهەتایی؛ کات و ساتی درێژخایەن و نەبڕاوە.

**ابد**[2]: *صفت*. هەتایی؛ هەمیشەیی؛ نەڤەبڕی؛ هەرماوی ‹حبس ابد: بەندی هەتایی›.

**ابدا** / 'abadā/: [عربی] *قید*. قەت؛ قەد؛ حەر؛ هەر؛ هەرگیز؛ حەریز؛ هەجگیز؛ هەرگیزای هەرگیز؛ هەرگیزا و هەرگیز؛ هەرگیسەی هەرگیس؛ ب چ تەرزا؛ ب چ ڕەنگا؛ هیچوەخت ‹ابدا او را ندیدەام: قەت نەمدیوە› *ابداً

**ابداً** / 'abadan/ [عربی] ☜ **اَبدا**

**ابداع** / 'ebdā'، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم*. بەدیهێنەری؛ داهێنەری؛ نۆهاوەری؛ نۆهێنەری؛ تازەهاوەری؛ کار یان ڕەوتی هێنانەکایەوە؛ داهێنان یان دروستکردنی شتی تازەبابەت ‹هر روز مدلهای جدیدی از کامپیوتر ابداع می‌کنند: هەموو ڕۆژێ جۆرێکی تازە لە کەمپیوتەر بەدی‌دینن›.

⊡ **ابداع کردن**: بەدیهێنان؛ داهێنان؛ دائێنان؛ لە نەبوو چێکردن؛ درووس کردن؛ وەشکەردەی؛ خولقاندن؛ ساز کردنی نوێ.

**ابداعی** / 'ebdā'î/: [عربی] *صفت*. داهێنراو؛ تازە داهاتوو؛ نۆ بە دیهێنراو ‹دیروز مهندس کارخانه روش ابداعی خود را نشان داد: دوێنێ ئەندازیاری کارخانە ڕەوشتی داهێنراوی خۆی پیشان دا›.

**ابدال** / 'abdāl/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* ۱. عەوال؛ عەودال؛ خەڵکی ماقووڵ و خاسکار ۲. *[تصوف]* حەوت مرۆی هێژا کە لە هەر چاخێکدا لە حەوت پەڕی دنیاوە، ڕێبەری خەڵکیان وەئەستۆیە ۳. خواناس؛ خودێنیاس.

**ابدال** / 'ebdāl/: [عربی] *اسم*. *[ادبی، نامتداول]* کار یان ڕەوتی گۆڕین؛ گوهرین؛ گۆڕینەوە؛ واڕایوە؛ ئاڵوگۆڕکردن.

**ابدالآباد** / 'abadal'ābād, 'abadol'ābād/: [عربی] ☜ **آبدالدهر**

**ابدالدهر** / 'abadoddahr,'abadaddahr/: [عربی] *قید*. هەمیشە؛ هەمیشەدەرە؛ حەتاـحەتا؛ هەتاـهەتایە؛ هەتا جیهان مایە: **ابدالآباد**

**ابدان** / 'abdān/: [عربی] جمعِ ☜ **بَدَن**

**ابدی** / 'abadî/: [عربی] *صفت*. هەتاـهەتایی؛ تاسەر؛ بێبڕانەوە؛ هەرهە؛ هەرمانی؛ هەمیشەیی ‹زندگی ابدی: ژیانی هەمیشەیی›.

**ابدیت** / 'abadîyyat/: [عربی] *اسم*. هەمیشەیی؛ هەمیشەیەتی؛ هەرمانی؛ هەرهەیی ‹ماتریالیستها به ابدیت گیتی معتقدند: ماتریالیستەکان بڕوایان بە هەمیشەیەتی جیهانە›.

**ابرـ** / 'abar/: *پیشوند*. زلـ ؛ گەورەـ ؛ گەپـ؛ کەلەـ؛ مەزن؛ گاورە؛ گر؛ ئەورە؛ هەورە؛ سلال؛ بالا؛ زۆر؛ خاوەن چۆنیەتی بارودۆخی هەڤیازی و باشتری ‹ابرقدرت: زلهێز›.

**ابر** / 'abr، ـها/: *اسم*. ۱. هەور؛ ئەور؛ ئێور؛

هەڤر؛ ئەوره؛ هۆر؛ تەمی بەر ئاسمان کە بارانی لێوە دەبارێ ٢. هەورک؛ هەور؛ هەوری؛ شتێکی نەرمی کون-کونە کە بۆ شت شۆردن بەکار دەچێ ٣. گیایەکە لە تیرەی هارویگەل، کە هەودای ناو ساقەتەکەی وشک دەکەنەوە و بە جێی هەورک بەکاری دێنن.

▣ **ابر آلتواستراتوس** ☜ **ابر فراز پوشن**

**ابر آلتوکومولوس** ☜ **ابر فراز کومەای**

**ابر استراتوس** ☜ **ابر پوشن**

**ابر استراتوکومولوس** ☜ **ابر پوشنِ کومەای**

**ابر الکترونی:** [ شیمی] ئوربیتال؛ هەوری ئلیکترۆنی؛ هەورئاسایەک کە ئلیکترۆن بە هۆی سووڕخواردنی یەکجار خێرا بە دەوری ناوکی ئەتومدا بەدی دێنێ.

**ابر بارا:** هەوره بارانە؛ هەوری پڕ و توند؛ وارانە هەور؛ هەوره تەڕه؛ گەلوازه هەوری تێکسمراو کە بارانی لێدەبارێ: **ابر نیمبوس؛ ابر بارانزا**

**ابر باراپوشن:** هەوری تۆکمە و نزم، بە ڕەنگی خۆڵەمێشی تاڵ کە بەفر و باران پێکدێنێت: **ابر نیمبواستراتوس؛ ابر تیرەی بارنزا**

**ابر بارانزا** ☜ ابر بارا

**ابر پردەای** ☜ **ابر پوشن**

**ابر پستانی:** هەوره مەمکینە؛ هەوره مەمینە؛ هەورێ کە لە مەمکە ئەکا و لە سۆنگەی ڕاگوێزانی گەرما و هەلچوونی شەستەڕەهێلەوە پێک دێ: **ابر ماماتوس**

**ابر پشتەای** ☜ **ابر پوشنِ کومەای**

**ابر پوشن:** هەوری داگر؛ عەڤرێ گوگری؛ هەوری توێ-توێ؛ هەوری تەنک و خۆڵەمێشی: **ابر استراتوس؛ ابر پردەای؛ ابر لایەای**

**ابر پوشن کومەای:** هەوری پڕ؛ عەڤری تیر؛ کۆمە هەوری داگری خۆڵەمێشی: **ابر استراتوکومولوس؛ ابر پشتەای**

**ابر تیرەی بارانزا** ☜ **ابر باراپوشن**

**ابر خرمنی** ☜ **ابر کومەای**

**ابر رشتەای** ☜ **ابر کاکلی**

**ابر سیرواستراتوس** ☜ **ابر کاکلی پوشن**

**ابر سیروس** ☜ **ابر کاکلی**

**ابر سیروکومولوس** ☜ **ابر کاکلی کومەای**

**ابر فراز پوشن:** هەوری پەردەئاسا و یەک چەشن بە ڕەنگی بووڵ: **ابر آلتواستراتوس**

**ابر فرازکومەای:** کۆمە هەوری بەربلاوی تۆپەڵە ئاسا: **ابر آلتوکومولوس**

**ابر کاکلی:** هەوری ڕیشاڵ-ڕیشاڵ و سپی بە بیچمی پەلەگەلی گەوره و گچکە: **ابر رشتەای؛ ابر سیروس**

**ابر کاکلی پوشن:** هەوری سپیکەلەی زقماوی کە داوێنی ئاسمانی دەڤەرێک دادەگرن، بەلام بە هۆی تەنک بوونیان ناکەونە بەر چاو: **ابر سیرواستراتوس**

**ابر کاکلی کومەای:** تۆپەکی شیری ڕەنگ لە گەلوازه هەوری بەرز و بلیند: **ابر سیرکومولوس**

**ابر کومولوس** ☜ **ابر کومەای**

**ابر کومولونیمبوس** ☜ **ابر کومەای بارا**

**ابر کومەای:** هەوری بە بیچم وەک کۆلەکە و ئەستوونی بورجئاسا: **ابر خرمنی؛ ابر کومولوس؛ ابر کوهەای؛ ابر گلولەای**

**ابر کومەای بارا:** هەورێک بە بیچمی سندان بە پەراوێزی سپی و ئاوێزی ڕەشەوە، کە زۆرتر هەوره برووسکەی لەگەڵدایە: **ابر کومولونیمبوس**

**ابر کوهەای** ☜ **ابر کومەای**

**ابر گلولەای** ☜ **ابر کومەای**

**ابر لایەای** ☜ **ابر پوشن**

**ابر ماژلان:** هەوری ماژێلان؛ هەرکام لە دوو

پەلە هەورئاسا چکۆلە و پرشنگدارە کە لە ئاسمانی لەتەگۆی باشووریدا دیارن و نزیکترین کاکەشانن بە کاکەشانی ئێمەوە.

**ابر ماماتوس** ☜ **ابر پستانی**

**ابر نیمبواستراتوس** ☜ **ابر بارا پوشن**

**ابر نیمبوس** ☜ **ابر بارا**

**ابرا** / 'ebrā/: [عربی]/اسم. /حقوق/ چاوپۆشی؛ ژێگەری؛ لێبووری؛ لێگەڕانی خاوەنی شتێ لە ساندنەوەی شتەکەی. هەروەها: **اِبرا کردن**

**ابرار** / 'abrār/: [عربی]/اسم. /ادبی/ خاسان؛ خاسکاران؛ چاکان؛ نووکان؛ مرۆڤە باشەکان.

**ابراز** / 'ebrāz/: [عربی]/اسم. /ادبی/ کار یان ڕەوتی دەربڕین؛ دەرخستنی باوەڕ، بۆچوون، ڕوانگەگەل یان دۆخێک ‹ابراز انزجار: دەربڕینی بێزاری›.

◙ **ابراز تنفر:** ڕق دەربڕین؛ دەربڕینی ڕک و قینی خۆ لە ئاستی شتێک، کارێک یان کەسێکەوە.

**ابراز وجود:** کار یان ڕەوتی خۆ نواندن؛ خۆ نیشاندان؛ خۆ هەلدانەقە؛ لێهاتوویی و توانایی خۆ ڕانان ‹آزاد هم خواست ابراز وجود کند، گفت من هم کمک می‌کنم: ئازادیش ویستی خوی بنوینی، گوتی منیش یارمەتی دەدەم›.

**ابرآلود** / 'abrālûd/: صفت. هەوری؛ هەورین؛ هەورایی؛ هەور- هەوری.

**ابرآلودگی** / 'abrālûdegî/: اسم. ۱. هەوراوی؛ هەورەلاوی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی هەور و هەلا بوون ۲. لێلی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی لێلی، بۆری، ماتی یا نەزانراوی لە شتێک.

**ابرام** / 'ebrām/: [عربی]/اسم. ۱. پژل؛ پاداگری؛ پێداگری؛ لووبلووب؛ پێزەبری؛ شێلگیری؛ پێچەقینی؛ سوور بوون لە سەر شتێک ۲. /حقوق/ بەڕاست زانینی بڕیاری دادگایەک لە لایەن دادگایەکی بالاترەوە.

**ابرانگل** / 'abar'angal/، ها/: اسم. /زیست‌شناسی/ دایکەکرمانە؛ کرمی دەرەکی یان ناوەکی کرمێکی دی.

**ابررسانا** / 'abar.resānā/، ها/: صفت. پڕگەیێنەر؛ خاوەن تایبەتی گەورە ڕەسانایی.

**ابررسانایی** / 'abar.resānāyî/: اسم. پڕگەیێنەری؛ تایبەتمەندی بڕێ شت کە هێزی کارەبایی لە خۆوە بە تەواوی بەڕێ دەکەن.

**ابرشهر** / 'abaršahr/، ها/: اسم. گەورەشار؛ گەڤرەبازێر؛ گاشار؛ شارمازن؛ شاری زۆر گەورە، بە خەلکێکی زۆرەوە.

**ابرقدرت** / 'abarqodrat/، ها/: اسم. زلهێز؛ هێزینمەزن؛ ولاتی خاوەن ئامرازی زۆر پێشکەوتووی شەڕ بە دەسەلاتی چەکداری و ئابووری فراوانەوە.

**ابرمرد** / 'abarmard/، ان/: اسم. گەورەپیاو؛ مەزنەپیاو؛ کەلەپیاو؛ خۆشمێر؛ زەلامی ژێهاتی؛ پیاوی خاوەن خوو و خدەی مرۆڤانە و هەلسوکەوتی هەلکەوتە و بەرچاو.

**ابرو** / 'abrû/، ها؛ ابروان 'abrovān/: اسم. ئەبرۆ؛ برۆ: ۱. بەرم؛ برم؛ برە؛ برهـ؛ برێ؛ بری؛ بورگ؛ موژەلانک؛ قاژ؛ تک؛ خەتە مووی بەر تەویل و بانچاو ۲. کەوانەی بالاخانەی چاو کە بە تایبەت مووی لێ دەڕوێ ۳. /ریاضی/ چەلەمە؛ ئاکۆلاد.

◙ **ابروی پاچەبزی:** بڕۆی پڕ؛ بڕۆی پەیوەستی پان و پۆڕ و ڕەش.

**ابروی پیوستە:** بڕۆی پەیوەست؛ قاژە برۆ؛ پەیوەست؛ بڕۆێن پێکەڤە نویسیای؛ برۆی پێکەوە لکاو.

**ابروی کشیدە:** بڕۆی درێژ و باریک؛ بڕۆی قەیتانی.

**ابروی کمانی:** بڕۆی کەوانی؛ بڕۆی بە کەوانەی زۆرتر لە ڕادەی ئاساییەوە.

**ابرو آمدن:** */گفتاری/* بڕۆ هەڵتەکاندن؛ بریّ هۆر برنەی؛ بە بڕۆ ناز و نیم‌نازکردن: */ادبی/* **ابرونمودن؛ تاق ابرو نمودن**

**ابرو انداختن:** هێماکردن بە بڕۆ؛ بریّ ژلێونەی.

**ابرو باز کردن:** چەڵمە لێدان؛ پیّ زیادکردنی وتەیەکی دیکە بە هۆی نیشانەی چەڵمەوە.

**ابرو بالا انداختن:** */کنایی/* بڕۆ هەڵتەکاندن؛ ڕێک‌نەکەوتن؛ نەسازان.

**ابرو برداشتن:** ژێر بڕۆ گرتن؛ بڕۆ گرتن؛ ژێر بڕۆ دەرهاوردن؛ بریّ هۆر گێرتەی؛ بڕۆ زراف کرن؛ گرتنی مووگەلی ژێر بڕۆ بە مووکێش، بە مەبەستی پتر دەرخستنی کەوانەی بڕۆ.

**ابرو تُرش کردن** ☜ گره بر ابرو افکندن، **گره**

**ابرو خم نکردن** ☜ خم به ابرو نیاوردن، **خم**[1]

**ابرو درهم کشیدن:** ناوچاو ترشاندن؛ ڕوو گرژ کردن؛ ناوچاو دانەیەکدا؛ ناوچاو تاڵ کردن؛ خۆ تویش و تەشەنەکرن؛ ناوچاو بە یەکا دان؛ ویّ گەمۆرکەردەی.

**ابرو نازک کردن:** */کنایی/* نازکردن؛ خۆ ڤەهەژاندن؛ خۆ بە بێ‌مەیل نیشاندان.

**ابرو نمودن** ☜ **ابرو آمدن**

**ابروکمان** / abrûkamān' / ☜ **کمان‌ابرو**

**ابروگشاده** / abrûgošāde'، ـها،ـگان/: *صفت.* ڕووگەش؛ ڕووخۆش؛ ڕووکراوە؛ خۆشڕوو؛ میاچەمافەریح ‹ابروگشاده باش چو دستت گشاده نیست: ڕوگەش بە ئەگەر دەستت بەتاڵە›.

**ابره** / abre' /: *اسم.* ڕوە؛ پارچەی ڕووکاری جل‌و بەرگ.

**ابری** / ābrî /: *صفت.* هەوری: ۱. هەورایی؛ هەورین؛ هەوردار؛ بە هەور؛ داپۆشراو بە هەور ‹آسمان ابری: ئاسمانی هەوری› ۲. هەورکی؛ هەر شتیّ کە نەرم و فش و کون‌کون و سووک بیّ ۳. هەورئاسا؛ هەورینە؛ بە تەشک و شێوەی هەور؛ وەک هەور.

**ابریشم** / abrîšam' /: *اسم.* هەورێشم؛ هەوریشم؛ هەڤریشم؛ هۆریشم؛ هەورەمیش؛ هاوریشم؛ هاورێشم؛ ئاوریشم؛ ئاورێشم؛ ئارموش؛ ئارمیش؛ ئاڤلمیش؛ هەلبسم؛ ئەلبسم؛ تەمووش: ۱. داوی لیکاوی کرمی ئاوریشم ۲. */مجازی/* بەن و قوماشی چێکراو لە هەورێشم.

▣ **ابریشم مصنوعی:** هەورێشمی دەسکرد.

**کِرم ابریشم** ☜ **کِرم**

**ابریشمباف** / abrîšambāf' /: *اسم.* هەورێشم‌چن؛ کەسیّ کە چنراوەی لە تاڵی هەورێشم دەهۆنێتەوە.

**ابریشمبافی** / abrîšambāfî' /: *اسم.* هەورێشم‌چنی: ۱. کار یان ڕەوتی چنینی قوماشگەلی هەورێشمی ۲. /ـها/ شوێنیّ (کارگە یان کارخانە) کە هەورێشمی تێدا دەچنن ۳. کاری هەوریشم چن.

**ابریشمتاب** / abrîšamtāb'، ـها؛ ـان/: *اسم.* هەورێشم ڕێس؛ کەسیّ کە تاڵگەلی پیلۆ (تەتڵە میوە) دەڕێسیّ و بەنی هەورێشمی دروست دەکا.

**ابریشمتابی** / abrîšamtābî' /: *اسم.* ئاوریشم‌ڕێسی: ۱. ڕێسانائەڤریشم؛ کار یان ڕەوتی بادانی هەورێشم؛ هۆرێشم‌ڕێستەی ۲. /ـها/ کارگەی هەورێشم ڕێس ۳. پیشەی هەورێشم ڕێس.

**ابریشمدوزی** / abrîšamdûzî'، ـها/: *اسم.* ئاورێشم دووری؛ چەشنیّ گوڵدووری بە شێوەی دوورانـدنی نەخش ونیگار بە

هەوداگەلی هەورێشمی خاو و نەڕێسراو لە سەر پارچەوە.

**ابریشم‌کش** / 'abrîšamkeš ، ـها؛ ـان/: *اسم.* هەورێشم‌کێش؛کەسێ کە هەوداگەلی ئاوریشمی بە چەرخی هەورێشم‌کێشی لە پیلۆ (تەتلە میوە) دەکاتەوە.

**ابریشم‌کشی** / 'abrîšamkešî/: *اسم.* هەورێشم‌کێشی.

**ابریشمی**[1] / 'abrîšamî/: *اسم. [نامتداول]* ۱. هەورێشم‌ڕێس ۲. /ـها/ کاپووت؛ کاندوم.

**ابریشمی**[2] / ـها/: *صفت.* هەورێشمین؛ هاوریشمی؛ لە هەورێشم.

**ابریشمین** / 'abrîšamîn/: *صفت. [ادبی]* هەورێشمی؛ هەورێشمین؛ ئاورێشمین.

**ابزار** / 'abzār ، ـها/: *اسم.* ئامراز؛ هامراز؛ ئالاڤ؛ ئامێر؛ ئامیر؛ ئامووێر؛ کەرەسە؛ کەرەستە؛ ئەسباب؛ ئەسپاب؛ هەسپاو؛ چەکچێو؛ هەرکام لە ئامێرانی کار و پیشەسازی.

◙ **ابزار برقی:** ئامرازی کارەبایی؛ ئەسپابی بەرقی؛ ئامێرێن کارەبایێ.

**ابزار تولید:** ئامێری بەرهەمهێنان؛ ئامێر و دەزگاگەلێک کە بۆ بەرهەمهێنانی کەل‌وپەل بەکار دێن.

**ابزار دستی:** ئامێری دەستی؛ ئامێر و کەرەسەی پێویست بۆ کارگەلی دەستی.

**ابزار کار:** ئامرازی کار؛ ماغرمە؛ ماعزەمە؛ ئامیر؛ مالزەمە.

**ابزار ماشین:** ماشێن؛ هەر کەرەسەیەک کە بە موتۆر کار دەکا.

**ابزار یدکی:** یەدەک؛ یەدەکی؛ ئامرازی زیادی بۆ جێگرتنەوەی ئەوانەی لەکار دەکەون.

**ابزارآلات** / 'abzārālāt/: [فارسی/ عربی] *اسم.* ئامێران؛ ئامرازان؛ سەرجەمی ئەو شتانە کە بە ناو ئامێرەوە بە کار دێن.

**ابزارسازی** / 'abzārsāzî/: *اسم.* ئامێرسازی: ۱. کار یان ڕەوتی چێکردنی ئامێرگەلی پێویست بۆ کار (وەک تەور، کارد، هاچەر و...) ۲. /ـها/ کارگە یان کارخانەیێک کە ئامێری تێدا چێ دەکەن.

**ابزارفروش** / 'abzārfurûš، ـها؛ ـان/: *اسم.* ئامێرفرۆش؛ فرۆشیاری ئامرازگەلی پیشەیی (وەک هەرە، ترێشتە، مالە، هاچەر، چەکوش و...) و کەرەستەگەلی پێداویست بۆ ئاوەها کارگەلێک (وەک پێچ و مۆرە و...).

**ابزارفروشی** / 'abzārfurûšî/: *اسم.* ئامێرفرۆشی: ۱. پیشە یان کاری ئامێرفرۆشی ۲. /ـها/ فرۆشگەی ئامێر ۳. کاری ئامێرفرۆش.

**ابزارگرایی** / 'abzārgerāyî/: *اسم.* ئامرازخوازی؛ ئامرازەوگری؛ ئامێرگرەوی؛ ئایینی فەلسەفی شوێنگری بنەمای کار، کە دەڵێ بیر و هزر دەبێ ئامێری بەڕێوەبردنی ژینگە بن و بایەخی بیر و بۆچوون دەبێ لە ڕووی کارتێکەرییان لە سەر ئەزموون و پێشکەوتنی مرۆڤەوە دەستنیشان بکرێ: **اصالت وسیله**

**ابزارمند** / 'abzārmand/ ☜ **افزارمند**

**ابژکتیویسم** / 'objektîvîsm/: [فرانسوی] *اسم.* دەروەخوازی؛ دەرەوەخوازی؛ دەروەگری؛ دەرەوگری؛ هاندانی هەست و نەست بەرەو دنیای دەرەوەی خۆ، بەرەو کۆمەڵگا.

**ابستروکسیون** / 'obstroks(i)yon/: [فرانسوی] *اسم.* ۱. *[سیاست]* گەلەکۆمەی دەستەیەک بە مەبەستی بەرگری لە کۆبوونەوەی زۆرینەی پێداویست ۲. *[پزشکی]* گیراوی؛ بەسراوی؛ ڕەوتی گیران؛ بەستران؛ کپ بوونەوەی دەمار بە هۆی

چەوریەوە.

**ابصار** / absār'/: [عربی] جمعِ ☜ **بَصَر**

**ابطـال** / ebtāl'/: [عربـی]/اسـم. کـار یـان ڕەوتی پـووچ کـردن؛ پـووچ کردنـەوە؛ پـوپچکرن؛ هـەڵـوەشـاندن ‹ابطـال آرای دو حـوزەی انتخـابی: پـووچ کـردنی دەنگـەکـانی دوو بنکـەی هەڵبژاردن›.

**ابعاد** / ab'ād'/: [عربی] جمعِ ☜ **بُعد**

**ابقـا** / ebqā'/: [عربـی]/اسـم. کـار یـان ڕەوتی هێشتنەوە؛ هێلانەڤـە؛ دانانـەوەی کـەسـێ یـان شتێک لە جێی خۆی.

▣ **ابقـا شـدن:** مانـەوە؛ مـەنـایوە ‹اسـتاندار در سـمت خـود ابقـا شـد: پارێزگـار لـە جێگـەی خـۆی مایەوە›.

**ابقا کردن:** هێشتنەوە؛ دانانەوە؛ ئاسەیوە.

**ابقا نکردن:** نەبـوورین؛ نـەویـەردەی؛ چاوپۆشـی نەکـردن؛ چـاف لـێنـەنقاندن ‹او در آزار رساندن به کسی ابقا نکرد: ئـەو خـۆی لـە ئـازاردانی خـەڵـک نەبوارد›.

**ابـلاغ** / eblāq'، ـهـا؛ ـات/: [عربـی]/اسـم. ۱. پـێڕاگـەیانـدن؛ پـێوتـن؛ پنـەیاونـەی؛ ڕاگـەیانـدن؛ کـاری گـەیانـدنی نامـە یـان ڕاسپاردە بە کەسـێ ۲. *[حقـوق]* پـێڕاگـەیانـدن؛ پێـوتن؛ پنـەیاونـەی؛ ڕاگـەیانـدن؛ گـەیانـدنی پەڕەگەلی دادپرسـی یـان کارگێـڕی بـە وەرگـر، بـە هـۆی ڕاسـپاردەوە ۳. ڕاگـەیانـدە؛ ڕاگەیێنراو.

▣ **ابـلاغ شـدن:** ڕاگـەیێنـران (بـە شـێوەی ڕەسمی). هەروەها: **ابلاغ کردن**

**ابلاغیـه** / eblāqîyye'، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. بلاوکراوە؛ ڕاگـەیـەنـراو؛ ڕاگـەیانـدە؛ پنـەیاونـە؛ دەسـتوور یـان بـڕیارێکی بـریتی لـە بابـەتێـک کـە لـە لایـەن پێگـەیـەکـی ڕەسمیـەوە بـڵاو دەبێتەوە.

**ابلـق** / ablaq'/: [معـرب از فارسـی] صـفت. ئەبـڵەق؛ ڕەش و سـپی؛ سـوور و سـپی؛ بـازگ؛ بـازوو؛ بـازە؛ بـەوز؛ بـۆز؛ هـەبـڵەق؛ ماچیـل؛ ڕەشـباز؛ چیـل؛ ڕەش و سـپی تێکـەڵاو؛ بـازگی خاڵدار؛ ڕەش بـەڵـەک؛ دوو ڕەنـگ، بـەتایبـەت ڕەش و سپی.

**ابلـک** / ablak'، ـهـا/: اسـم. گرانـک؛ بـابردەڵـە؛ پوورئاشـۆکە؛ گیایـەکـی بـە لـق و پـۆی زۆر و ڕیشەی ناسکەوە، بـا هـەڵـیدەکـەنـێ و بـە دەم خۆیەوە دەیخولێنێتەوە: **بادآورد**

**ابلـه** / ablah'، ـان/: [عربـی] صـفت. گـەوج؛ چـڵ؛ گێلۆکـە؛ گێـل؛ گێلـە؛ قـەوج؛ فـەحـە؛ شافێر؛ لەوچ؛ دەبەنگ؛ بـلح؛ خـەشـۆ؛ بـێئـاوەز؛ قـەوچـەڵ؛ قـەوچ؛ لاوژ؛ ئاوجـاو؛ گـەوجولـەوج؛ لەوێژ؛ لـەوژەکـەر؛ هـشتاری؛ کـەمهـۆش و بـێ توانایی زەینی.

**ابلهانـه**[1] / ablahāne'/: [عربـی/فارسـی] صـفت. گـەوجانـە؛ گێلانـە؛ بـلحانە؛ خـاوەن دۆخ یـان چۆنیەتیـەکـی دوور لـە ئـاوەز و زانـست ‹حـرف ابلهانەای زدی: قسەیەکی گەوجانەت کرد›.

**ابلهانه**[2]: قید. گەوجانـە؛ لـە ڕووی نـەزانیـەوە؛ بـە شێوەی گـەوجـان ‹ابلهانـه حـرف زدی: گـەوجانـە قسەت کرد›.

**ابلهـی** / ablahî'/: [عربـی]/اسـم. گـەوجـی؛ گێلـی؛ گـێلاتی؛ بـێئـاوەزی؛ دەبـەنگی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی گـەوج بـوون ‹آدم بـه ابلهـی او دیدەای؟: کەست بە گەوجی ئەو دیوە؟›.

**ابلی** / abolî'/ ☜ **ابُولی**

**ابلـیس** / eblîs'/: [معـرب از یونـانی]/اسـم. *[ادبـی]* شەیتان؛ ئاهریمەن؛ دۆزاک.

**ابلیسک** / obelîsk'/: [؟] ☜ **میل ـ۳**

**ابـن** / ebn'، اَبنـا/: [عربـی]/اسـم. کـوڕ؛ منـداڵ؛ کـوڕی کـەسـێ (بـڕێ جـار«بـن» دەڵـێن، وەک: ابن‌یوسف= بن‌یوسف: کوڕی یوسف).

**ابنـا** / abnā'/: [عربـی]/اسـم. ۱. جمـعِ ☜ **اِبـن** ۲. *[مجـازی]* منـدالان؛ منـالان؛ بـەرە؛ فرزنـدان؛

زاوڵـێ؛ زارۆکـان؛ زارۆکـان؛ بچیـک؛ کـەچک و بەچک.

▣ **ابنـای بـشر**: خـەڵـک؛ بنیـادەم؛ ئـادەمیـزاد؛ نەفێین ئادەمی.

**ابنـای زمـان**: خـەڵـکی رۆژگـار؛ خـەڵـکانی سەردەم؛ خەڵکین سەردەمی.

**ابنـای وطـن**: منـداڵانی وڵات؛ هاووڵاتیـان؛ هاونیشتمانان؛ هاوزێدان.

**ابـن‌الـسبیل** / 'ebnossabîl/: [عربـی]اسـم. [فقـه] رێبوار؛ رێـڤینگ؛ بـە تایبـەت رێبـواری دامـاو و هەژار.

**ابـن‌الوقـت** / 'ebnolvaqt ، ـهـا/: [عربـی] صفت. هەلپەرست؛ دەرفەتخواز؛ دلیڤەخاز.

**ابنــه** / 'obne/: [عربــی]اسـم. ۱. قوونــەک؛ قوندەر؛ قنگـە؛ قنگـدەر؛ پوشـت؛ پـشتە؛ پـشت؛ دوودەکـی؛ نێـری حیـز؛ نێـری گانـدەر؛ پیـاوی حیز ۲. ئاڵـۆش‌و خـورووی کـۆم ۳. ـهـا/ لـک؛ لکە؛ گۆگ؛ گرێ لە چێودا.

**ابنیه** / 'abnîye/: [عربی] جمعِ ☜ **بَنا**

**ابـو** / 'abû/: [عربـی]اسـم. بـاوک؛ بـاب؛ بـاڤ؛ تاتــە؛ نازنــاوێ بــۆ بــرێ پیــاوان لــە کۆنــدا ‹ابوالحسن: بـابی حـەسـەن› (بـرێ جـاریش «بـو» دەڵـــێن، وەک: بوالحـــسن= ابوالحـــسن: بابـــی حەسەن).

**ابـوا** / 'obovā ، ـهـا/: [فرانـسوی]اسـم. ئـەبـوا؛ جـۆرێ ئـامرازی مووسـیقای رۆژئاواییــە بــە شێوەی لوولەیەکی درێـژ، دوو زوانـەی پێـوەیە کە لە دەمی دەنێن و فووی پیدا دەکەن.

**ابــواب** / 'abvāb/: [عربــی]اســم. [ادبـی] ۱. دەرگاگــەل؛ دەرگانــە ‹ابـواب رحمـت بـە رویـش گـشوده شـد: دەرگانــەی رەحمــەت بــە روویــدا کرایەوە› ۲. جمعِ ☜ **باب**[1]

**ابوابجمــــع** / 'abvābcam'/: [عربـــی]اســـم. کارکــەران؛ پــالێن؛ پالــە؛ هــەرمانکــەرێ؛ قــەرەواش؛ کارکـەرانی ژێـردەسـەلاتی کـەسێ یان دامەزراوەیەک.

**ابــوابجمعی** / 'abvābcam'î/: [عربــی] صــفت. گــشتی؛ پێــوەندیــدار یــان بــەســراو بــە کارکەرانەوە.

**ابوالبــشر** / 'abolbašar/: [عربـی]اسـم. بابـەدەم؛ باوکی مرۆڤ؛ یەکەمین مرۆڤ؛ باوە ئادەم.

**ابوالهــــول** / 'abolhowl/: [عربــــی] صــفت. [مجازی] ترسـێنەر؛ زاتبـەر؛ زاڵـەتـۆقێن؛ دەعبـا؛ زەندەقبەر؛ زراڤبەر.

**ابـــوت** / 'obovvat/: [عربـــی]اســـم. [ادبـی] بــاوکی؛ بــاوکێتی؛ بــار و دۆخ یــان چۆنیــەتی باوک بوون.

**ابوطیــاره** / 'abûtayyāre ، ـهـا/: [عربـی]اسـم. [مجـازی] لۆقلـۆق؛ ئاسـنجاو؛ قـوڕازە؛ ماشـینی زۆر کۆن و لەکارتە: **ابوقراضه**

**ابوعطــا** / 'abû'atā/: [عربــی]اسـم. [موسـیقی] ئەبووعـەتـا؛ ئاوازێـک لـە دەسـتگای شـوور، لـە مووسیقای ئێرانیدا.

**ابوقراضه** / 'abûqorāze/: [عربی] ☜ **ابوطَیّاره**

**ابــولی** / 'abolî/: [عربــی]اســم. [گفتــاری] ۱. فـلانی؛ فیـسارەکـەس؛ کـابرا؛ کـاورا؛ کـەسـی نادیار ۲. [کنایی] کێـر؛ ئـامێری نێرینـە یـی پیـاو ***آبُلی**

**ابونیـت** / 'ebonît/: اسم. لاسـتیکی سـەخـت و رەشی گۆگرد لێدراو.

**ابـوی** / 'abavî/: [عربـی]اسم. ۱. بـاوکم؛ بـابم؛ تاتــەم ‹ابـوی سـلام رسـاند: بـاوکم سـەلامـی گەیانـد› ۲. بـاوک؛ تاتـە؛ بـاب ‹خدمت ابوی‌تـان عرض کردم: خزمەتی باوکتانم ڕاگەیاند›.

**ابــوین** / 'abaveyn/: [عربــی]اسـم. [نامتـداول] دایبـاب؛ دایـک و بـاوک؛ ئـەدا و تاتـە؛ داڵـگ و باوگ.

**ابــه** / 'obe ، ـهـا/: [ترکـی]اسـم. ئۆبـە؛ هۆبـە؛ ئــاوایی یــان شــوێنی نیــشتەجــێ بــوونی رەشماڵی تورکەمەنان.

**ابهام** / 'ebhām' ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. لێڵی؛ گۆنگی؛ دۆخ یان چۆنیەتی گۆنگ و نادیار بوون ‹توضیح شما ابهام دارد: شرۆڤەکەت لێڵی تێدایە›.

**ابهت** / 'obohhat, 'obbohat/: [عربی]/اسم. سام؛ گەورەیی و شکۆیێ کە دەبێتە هۆی ترس، وێڕای ڕێز و پێیداهەڵدان لە بینەردا ‹مردی با ابهت بود: پیاوێکی بەسام بوو›.

**ابهر** / 'abhar/: [عربی]/اسم. [قدیمی] ئائۆرت؛ سووره دەمارى هەره گەورەى لەشى بڕبڕەداران.

**ابیات** / 'abyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **بیت**

**ابیض** / 'abyaz/: [عربی] صفت. [نامتداول] سپی؛ سپیکەڵە؛ چەرمە؛ چەرمەڵە؛ بە ڕەنگی سپی؛ سپی ڕەنگ.

**اپال** / 'opāl' ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ئوپال؛ چەشنێ ئاقیقی بەناوبانگ بە ئاقیقی سلێمانی.

**اپتومتری** / 'optometrî' ، ـها/: [فرانسوی] اسم. بینایی‌پێوی؛ سۆماپێوی؛ بیناپێمایی.

**اپتیک**[1] / 'optîk/: [فرانسوی]/اسم. ئۆپتیک؛ لقێ لە زانستی فیزیک کە خەریکی لێکۆڵینەوەی تایبەتمەندیگەلی نوور، بەرهەم هێنان و بڵاو بوونەوەی لە کۆئەندامگەلی بیناییە: **أوپتیک**

**اپتیک**[2]: صفت. ئۆپتیکی؛ نووری؛ سەر بە نوور یان بینایی.

**اپتیکی** / 'optîkî/: [فرانسوی] صفت. نووری؛ بینایی؛ سەر بە نوور یان بینایی.

**اپتیمم** / 'optîmom' ، ـها/: اسم. چاکینە؛ باشینە؛ باشترین دۆخی گونجاو.

**اپتیمیزاسیون** / 'optîmîzās(i)yon/: اسم. چاکینەسازی؛ باشینەسازی؛ چاکەوەکری.

**اپتیمیست** / 'optîmîst' ، ـها/: صفت. خۆشبین؛ گەشبین.

**اپتیمیسم** / 'optîmîsm/: اسم. خۆشبینی؛ گەشبینی.

**اپرا** / 'operā' ، ـها/: [فرانسوی از ایتالیایی]/اسم. ئۆپێرا: ١. چەشنێ شانۆ لەگەڵ مووسیقا، بە ئاوازی گشت یان زۆربەی ئەندامەکانەوە ‹اپرای ریگولتو: ئوپێرای ریگۆلتۆ› ٢. بینایەک بۆ پیشاندانی ئەم شانۆیە ‹در اپرا با هم آشنا شدند: لە ئۆپێرادا یەکیان ناسی›. هەروەها: **اپرا کمیک؛ اپرا موزیکال**

**اپراتور** / 'operātor/: [فرانسوی]/اسم. کاروەر؛ کارپێکەر؛ کاربەدەستی بەڕێخستن و کار کردن بە دەسگا یان ماشینێک (وەک چاپ، و...).

**اپسیلن** / 'epsîlon/: [یونانی]/اسم. ئیپسیلون: ١. پێنجمین پیتی ئەلفو بێتکەی یونانی ٢. [ریاضی، فیزیک] یەکجار کەم؛ نزیک لە سیفر.

**اپشک** / 'apšak/ ☜ **اَفشَک**

**اپل** / 'apel/: [فرانسوی]/اسم. ئەپێل؛ لە زمانگەلی بەرنامەنووسی کەمپیۆتەر.

**اپل** / 'epol' ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ئێپول؛ باڵنجە چکۆلەیەک کە بۆ جوانی دەخرێتە ژێر شانی جلکەوە.

**اپلیکیشن** / 'aplîkeyšen' ، ـها/: [انگلیسی] اسم. داخوازنامە.

**اپورتونیست** / 'oportunîst' ، ـها/: [فرانسوی] صفت. [سیاست] هەلپەرست؛ کەسێ کە بۆ دەرفەتێک دەگەڕێ تا کارێ بکا.

**اپورتونیسم** / 'oportunîsm/: [فرانسوی]/اسم. [سیاست] هەلپەرستی؛ کار یان ڕەوتی کە لگەری (زۆرتر ناڕەوا) لە ڕووداو یان بار و دۆخگەل.

**اپوزیسیون** / 'opozîs(i)yon/: [فرانسوی] اسم. [سیاست] ئوپۆزیسیۆن: ١. چوکڵەشکێنی؛ هەڵوێستگرتن دژ بە

بیرێک یان کارێک و کۆسپ خستنە سەر ڕێی ۲. گرۆی نوێنەران یان کەسانی نەیار لەگەڵ سیاسەتەکانی دەوڵەت لە کۆمەڵگایەکدا ۳. ڕێخراوە یان بەرەی نەیار.

**اپوسوم** / 'oposom/ ☜ **ساریگ**

**اپیدمی** / 'epîdemî ، ـها/: [فرانسوی]/سم. گیرۆیی؛ ئاهۆیی: ۱. [پزشکی] پەتایی؛ درمی؛ کار یان ڕەوتی بڵاو بوونەی نەخۆشیەک کە هاوکات لە جێیەکدا ژمارەیەکی زۆر گیرۆدە ئەکا ۲. [مجازی] هەر شتێکی بڵاوەو بوو و پەرەسێن.

**اپیدمیک** / 'epîdemîk/: [فرانسوی] صفت. [پزشکی] گیرۆ؛ پەتا؛ ئامۆ؛ درم؛ خاوەن تایبەتمەندی خێرا بڵاو بوونەوە بە شێوەیەک کە لە ماوەیەکی کورتدا، ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی ناوچە تووش دەکا.

**اپیدمیولژی** / 'epîdem(i)yolojî/: [فرانسوی] اسم. [پزشکی] پەتاناسی؛ درمناسی؛ ئاهۆناسی؛ لقێک لە ئازارناسی کە لە نەخۆشیگەلی گیرۆ و ڕێگەی بەرپێ گرتنیان دەکۆڵێتەوە.

**اپیکورآیینی** / 'epîkûr'āyînî/: [فرانسوی/ فارسی]/سم. ڕێبازێکی فەلسەفیە سەربە ئێپیکوروس فەیلەسووفی یوونانی (۳٤۱-۲۷۰ پێش زایین) کە ئامانجی ژیان لە بە دەست هێنانی خۆشی درێژخایەن لە ڕێگەی وەدەست خستنی ئارامشتی ڕەوانیەوە دەزانێ: **اپیکوری؛ اپیکوریسم**

**اپیکوری** / 'epîkûrî ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی] صفت. ۱. ☜ **اپیکورآیینی** ۲. خۆشبوار؛ ڕابویرە؛ خۆشگوزەران.

**اپیکوریسم** / 'epîkûrîsm/: [فرانسوی] ☜ **اپیکورآیینی**

**اپی‌گلوت** / 'epîg(e)lot ، ـها/: [فرانسوی] اسم. [کالبدشناسی] نایپۆش؛ کرۆچەنەی گەلائاسا لە پشتی زوانی بڕەـبڕەدارانەوە کە لە کاتی قووت دانی شتێکدا، ڕێگای نای دەبەستێ: **مُکبّی**

**اپیلاسیون** / 'epîlās(i)yon/: [فرانسوی]/سم. موو لابەری؛ موو هەڵکەنی؛ کاری لابردنی تووک و مووی زیادە و گەنەمووی لەش.

**اپی‌لپسی** / 'epîlepsî/: اسم. [پزشکی] فێ؛ خوداری؛ پەرکەم؛ ئازارە؛ نەخۆشی لەسەر هەستنەمان و چاوهەڵگەڕان و کەف چەراندنی جاروبارە.

**اتابک** / 'atābak، ـها؛ ـان/: [ترکی]/سم. [قدیمی] ئەتابەک؛ نازناوێک بووە لە بڕێ دەربارگەلی ئیسلامیدا (لە بنەڕەتدا بە واتای بابەگەورەیە): الف) بۆ میران و فەرمانڕەوایانی نیوە سەربەخۆ (وەک ئەتابەکانی فارس یان ئەتابەکانی مووسڵ) ب) بۆ وەزیران ‹امیر اتابک: میر ئەتابەک›.

**اتاق** / 'otāq/: [ترکی]/سم. دیو: ۱. ژوور؛ دیم؛ ئوتاق؛ وەتاخ؛ چاوەخانوو؛ چاوەماڵ؛ دیوەخان؛ وەتاق؛ ژووری دانیشتن؛ ئۆدە؛ هۆدە؛ ژوورێکی سەرگیراوی ماڵ کە بە دیوارگەلێک لە بەشەکانی تر جوێ بۆتەوە ۲. /ـها/ تاق؛ کەژاوە؛ بەشی سەرگیراوی ماشێن و... (اتاق ماشین: دیوی ماشین) ۳. /ـها/ بۆشایەتیەکی هۆدە ئاسا لە دەستگا یان ئامێرێکدا (اتاق تاریک: دیوی تاریک)
*اطاق

▣ **اتاق ایزوله**: دیوی جیاواز؛ دیوی جیاوبوو؛ دیوی جیاگانە؛ دیوی تایبەتی نەخۆشانی گیرۆیی.

**اتاق بازرگانی**: ژووری بازرگانی؛ یەکێتی بازرگانان؛ یەکگرتەی بازرگانان؛ یەکێتی بازرگانانی شار یان پارێزگایەک بۆ سەر و سامان پێدانی کاروبار و پاراستنی

قازانجی کۆ: **اتاق تجارت**

**اتـاق پـذیرایی:** میوانخانـه؛ دیـوەخـانی میوانان؛ دیوی میوان.

**اتاق تاریک:** */ئێتیک/* دیـوی تاریـک؛ سـندوق یان دیوێک کـە تـەنیـا لـە دیـواری بـەریـەوە کـونێکی چکۆلـەی تێکـراوە و لـەوێـوە تیـشکی ڕوونـاکی وەژوور دەکـەوێ و وێنـەی سـەرەونخـوونی شـتەکـان پیـشان دەدا.

**اتاق تجارت** ☜ **اتاق بازرگانی**

**اتاق تکی:** دیوی تەنیا؛ دیـوی یـەک کـەسـی؛ دیوی تاکەکەسی: **اتاق یک‌نفره**

**اتـاق درد:** دیـوی ژان؛ دیوێـک لـە زاینگـە یـان نەخۆشـخانەکـە ژنی سـەرەژانی تێـدا ڕادەگرن تا کاتی زایینی بگات.

**اتـاق سـردر:** چـوخم؛ چوخمـە؛ مـاڕێ؛ باڵەخانە؛ هۆدەی سەر دالان.

**اتـاق فرمـان:** دیـوی فـەرمـان؛ ژوورێـک کـە لەوێوە فـەرمانگـەلی پێویسـت بـۆ جێبـەجـێ کـردنی زنجـیرە کـردەوەیـەک (وەک شـەڕ یان وەگەڕ خستنی بەرنامـەگـەلی تـەلـەفزیـونی) دەدرێ و بەسـەرکردەوەکانـدا چـاوەدێری دەکرێ.

**اتاق کوچک:** لیر؛ ئۆدەی چکۆلە لە ماڵدا.

**اتـاق ناهـارخوری:** دیـوی فراوینخـۆری؛ دیوی نانخواردن.

**اتاق یک‌نفره** ☜ **اتاق تکی**

**اتـاقـــ اتـاق** [1] / 'otāq'otāq/: [ترکـی] *صـفت.* دیو ـ دیو؛ هۆدە ـ هـۆدە؛ چـەنچـاوە؛ بـە هـۆدەی زۆرەوە ‹قلعه اتاق‌اتـاق بـود: قـەڵاکـە هـودەـهـودە بوو›.

**اتاق ـ اتاق** [2]: *قید.* دیـو ـ دیـو؛ هـۆدەـ هـۆدە؛ چـاوەـ چـاوە؛ بـە شـێوەی دیوگـەلی جیـاواز ‹خانـه را اتـاق‌ـاتـاق اجـاره داده بـود: ماڵـەکـەی هودەـهودە دابووەکرێ›.

**اتاقـدار** [1] / 'otāqdār/، ـهـا؛ ـان/: [ترکـی/ فارسـی] */اسم.* هۆدەوان؛ کەسێ کـە لـە دامـەزراوەیـەکـدا (وەک میوانخانـە) کارگێـڕی ئاگـاداری و پـاک و خاوێن‌کردنەوەی هۆدەکانە.

**اتاقـدار** [2]: *صـفت.* دیـودار؛ وتاقـدار؛ بـەهـۆدە؛ هـەرچێـک هـۆدەی هـەبـێ ‹تراکتـور اتاقـدار: تەراکتۆری وتاقدار›.

**اتاقـک** / 'otāqak، ـهـا/: [ترکـی/ فارسـی] */اسـم.* دیـوەک؛ دیوۆچکـە: ١. لـیر؛ هـۆدەک؛ دیـوی زۆر بچـووک ‹اتاقـک نگهبـانی: هـودەی کێشک‌دان› ٢. پێکهاتەیـەک پتـر بـە شـێوەی دیـوێکی بچـووک، جیـاواز و گواسـتنی ‹اتاقـک تلفن: دیودکی تەلەفوون›.

**اتاقـه** [1] / 'otāqe، ـهـا/: [ترکـی] */اسـم.* *[قـدیمی]* کـلاو یـان تاژێـک کـە لـە پـەڕی پـەلـەوەران دروست بووە.

**ـاتاقه** [2]: *پیواژه.* ـ چـاوە؛ ـ دیـوە؛ ـ هـۆدە؛ ـ ژوور؛ ـ دیمه ‹خانەی دواتاقه: ماڵی دوودیوە›: **ـاطاقه**

**اتانـل** / 'etānol/: [فرانسوی] */اسـم.* *[شـیمی]* ئێتـانۆل؛ ئـەلکول ئیتیلیـک؛ تراوێکـی بـێ‌ڕەنـگ، هـەڵـچۆک و گـڕبـەرە کـە لـە پیـشەسـازی و دەرمـان و خواردنـەوەگـەلی ئـەلکولیـدا بـە کـار دێـت: **الکـل طبّـی؛ جـوهر شراب**

**اتئیـست** / 'ate'îst، ـهـا/: [یونـانی/ انگلیـسی] *صفت.* خوانەناس؛ دەهری؛ بێ‌بڕوا بە خوا.

**اتئیـسم** / 'ate'îsm/: [یونـانی/ انگلیـسی] */اسـم.* خوانەناسی؛ بێ‌بڕوایی بە خوا.

**اتبـاع** / 'atbā'/: [عربـی] */اسـم.* ١. جمـعِ ☜ **تابع** ٢. جمعِ ☜ **تَبَعه**

**اتبـاع** / 'etbā'/: [عربـی] */اسـم.* *[بـدیع]* هونـەری ڕیزکـردنی وشـەگـەلی هـاوکێش دوا بـە دوای یـەکتریـەوە (وەک: *[فارسـی]* تیـشه بـر ریـشەی اندیشه زدند. *[کُردی]* هـەشـت بـێ و لـە مـشت بـێ، نەک نۆ بێ و نەبێ).

**اتحـــاد** / 'ettehād، ـهـــا/: [عربــی]/اسـم. یـەکیـەتی؛ یـەکـێتی؛ یـەکایـەتی؛ هـەڤـگری؛ یـەکگـری؛ یـەکگرتـوویی ‹اتحـاد موجـب پیـروزی است: یەکیەتی هۆی سەرکەوتنە›.

▣ **اتحــاد جمــاهیری**: یــەکیــەتی کۆمــاران؛ کۆمارگەلی یەکگرتوو.

▣ **اتحاد داشتن**: یـەک‌گرتـوو بـوون؛ یـەکیـەتی هەبوون؛ یەکبوون؛ بـە یـەکـەوە بـوون ‹بـرای شکـست دشـمن بایـد اتحـاد داشـت: بـۆ شـکاندنی دوژمن دەبێ یەکیەتی بێ›.

**اتحــادکردن**: یـەک‌گـرتن؛ یـەک‌کـەوتـن؛ هەڤـهـاتن ‹همـه بـا هـم اتحـاد کردنـد: هـەمـوو پێکەوە یەکیان گرت›.

**اتحادیـــه** / 'ettehādîyye، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. یــەک‌گرتــە؛ یــەک‌گرتــوویی؛ یــەکــێتی؛ یـەکیـەتی؛ سـەنـدیکا؛ ڕێکخـراوەیـەک کـە لـە یەکـانگیر بـوونی کـەسـان، تـاقم یـان وڵاتـانی هاومـەبـەسـتو هـاودۆز پێـک دێ ‹اتحادیـەی کارگران: یەکیەتی کرێکاران›.

▣ **اتحادیــەی اقتــصادی**: یـەکیــەتی ئـابووری؛ یەکگرتەی ئابووری؛ یەک‌گرتـەیـەک کـە لـە نێـوان چـەن دامـەزراوە یـان دەوڵـەتـدا بـۆ وەدی‌هێنـانی هاوکاریگـەلی ئـابووری پێـک دێت.

**اتحادیــەی دفــاعی**: یـەکیـەتی بـەرگـری؛ یەک‌گرتەی بـەرگری؛ یـەک‌گرتـەیـەک لـە چەن دەوڵـەت بـۆ پـشتیوانی لـە یـەکتـر لـە ئاستی هێرشی دوژمندا.

**اتحادیــەی صــنفی**: یـەکیـەتی پیـشەیـی؛ یـەک‌گرتـەی پیـشەیـی؛ یـەک‌گرتـەیـەک نێوان کارمەنـدانی پیشەیـەک بـۆ پاراسـتنی قازانجگەلی ئابووری خۆیان.

**اتحادیــەی نظــامی**: یـەکیـەتی چـەکـداری؛ یەک‌گرتـەی چـەکـداری؛ یـەک‌گرتـەیـەکی زیـاتر لـە چـەن دەوڵـەت، بـە مـەبـەسـتی یاریکاری چەکداری لە نێوانیاندا.

**اتخـاذ** / 'ettexāz/: [عربی]/اسم. وەرگـری؛ کـار یـان ڕەوتی گــرتن، بــە دەس هێنــان یــان وەرگرتن. هەروەها: **اتخاذ شدن؛ اتخاذ کردن**

▣ **اتخاذ تصمیم**: ڕەوتی بڕیاردان؛ قەراردان.

**اتـر** / 'eter/: [فرانـسوی]/اسـم. *[پزشـکی]* ئیتێـر؛ تراوێکـی بـێ‌ڕەنـگ و هـەڵـچۆکە کـە وەک دەرمانێکی بێهۆش کردن بە کار دێ.

**اتـراق** / 'otrāq/: [ترکـی]/اسـم. وچـان؛ پـشوو؛ لـەنـگ؛ لـەنگـە؛ ئاشـۆی کـەم لـە شـوێنێکدا ‹بعـدازظهر همانجـا اتـراق کـردیم: دوای‌نیـوەڕۆ هـەر لەوێ وچانـماندا›.

▣ **اتــراق کــردن**: وچــان‌دان؛ پــشوودان؛ بــەزتــن؛ لــەنگــەر خــستن؛ بارخــستنی کاروان؛ کورت مانەوە لە جێیەکدا.

**اتــساع** / 'ettesā'، ـات/: [عربـی]/اسـم. هـەراوی؛ گوشـادی؛ بـازی؛ فـرەهـی ‹اتّـساع رگهـای خـونی: هەراوی دەمارگەلی خوێن›.

▣ **اتــساع دادن**: هـەراوکـردن؛ گوشـادکردن؛ فرەهـ کردن؛ بازکردن؛ کێشاندن.

**اتــساع یــافتن**: هـەراو بـوون؛ گوشـاد بـوون؛ کێش هاتن؛ بازبوون؛ هەڵماسین.

**اتــصال** / 'ettesāl، ـهـا؛ ـات/: [عربـی]/اسـم. لکـاوی؛ پێـوەنـدی؛ پێـک‌گـەیـشتوویی؛ پەیوەستەیی؛ ڕەوتی پێکەوە لکان.

▣ **اتــصال دادن**: لکانـدن؛ پێـک‌گـەیانـدن؛ پێـوەنـدی دان ‹سـر سـیم را بـه کابـل اصـلی اتـصال مـی‌دهـیم: سـەری سـیمەکـە دەلکـێنین بـە کـابلی سـەرەکیـەوە›. هـەروەهـا: **اتــصال داشتن**

**اتــصالاً** / 'ettesālan/: [عربـی]قیـد. *[نامتـداول]* لـە پەستا؛ پەیتـاپەیتا؛ پەساپـەس؛ هـەیتاـهـەیتا؛ بێ‌برانـەوە؛ یـەک لـە دوای یـەک؛ بـێ پـسانەوە ‹اتصالاً تقاضـای بازنشـستگی مـی‌کـرد: پـەیتاـپـەیتا داوای وەنیشتەیی دەکرد›.

**اتــــصالات** / ettesālāt'/: [عربــی]/اســـم. ١. لکامێر؛ لکەواڵە؛ هەریەک لەو ئامێرانەی دوو یان چەن پاژ پێکەوە دەلکێنن (وەک پێچ، پەرچ، ئەنیشکە، سێڕایی،...) ٢. لکانگە؛ شوێنی پێکەوە لکانی پاژگەلی ئامێر، دەزگا یان تۆڕێک.

**اتـصالی** [١] / ettesālî'، ـها/: [عربی]/اسم. [برق] لکیاگی؛ بەدی هاتنی لکانێکی کوتوپڕ و نەخواستە لە خولگەیەک یان ئامێرێکی کارەبایی بە هۆی پێوەلکاونی بڕێ پاژەگەلی لێک جیا.

**اتصالی** [٢]: صفت. لکاو؛ پێکەوە لکاو ‹قطعەهای اتّصالی: برگەگەلی لکاو›.

**اتفاق** / ettefāq'/: [عربی]/اسم. ١. پێکەوەیی؛ یەکانگیری؛ هاوڕێیی؛ یەک گرتوویی؛ سات؛ سانە ‹بە اتفاق هم رفتند: پێکەوە چوون› ٢. یەکگری؛ یەکبوونی؛ یەکیەتی؛ ڕەوتی یەککەوتن؛ هەڤهاتن ‹اتفاق آرا: یەکگری دەنگگەل› ٣. ـها؛ ـات/ ڕووداو؛ هەڵکەوت؛ ئەڵکەفت؛ ڕێکەوت؛ پێشهاتی لە نەکاو ‹از این اتفاقها زیاد دیدەام: لەم ڕووداوانەم زۆر دیوە›.

◙ **اتفاق آرا:** یەکگری رایان؛ تێکڕایی دەنگگەل؛ ڕەوتی هەموو پێکەوە لە سەر بیر و ڕایەک بوون.

**اتفاق غیرمنتظره:** ڕزم؛ قەوماوی لەنکاو؛ ڕووداوی چاوەڕوان نەکراو.

◙ **اتفاق‌افتادن:** قەومان؛ پێش‌هاتن؛ ڕوودان ‹وقتی این اتفاق افتاد، من دە سال داشتم: کاتێک ئەم کارەساتە ڕوویدا من دە سالم بوو›.

**اتفاق کردن:** پێکهاتن؛ سازیان؛ جۆرهاتن؛ یەک قسەکردن ‹همگی با هم اتفاق کردند: گشتیان لەگەڵ یەک پێکهاتن›.

**اتفاقاً** / ettefāqan'/: [عربی] قید. ١. بە ڕێکەوت؛ بە هەڵکەوت؛ وە هەڵکەفت؛ خۆ و بەختی؛ بەرێرەو؛ لە ڕووی ڕێکەوت و بە بێ‌ئاگەداری لە پێشوودا ‹رفتە بودم بازار کە اتفاقاً او را دیدم: چووبوومە بازاڕ بەڕێکەوت چاوم پێکەوت› ٢. بە پێچەوانە؛ وشەی پێداگری بۆ پەرسقی نەرێنی ‹اتفاقا من نظر دیگری دارم: بە پێچەوانە من ڕایەکی‌ترم هەیە›.

**اتفاقی** [١] / ettefāqî'/: [عربی] صفت. هەڵکەوت؛ هەڵکەتی؛ بەدەگمەن؛ بەختەکی؛ هەڵکەفت؛ پێوەندیدار بە دۆخ یان دیاردەیەکی لەنکاو و چاوەڕوان نەکراو ‹فرصتهای اتفاقی: دەرفەتگەلی هەڵکەوت›.

**اتفاقی** [٢]: قید. [گفتاری] بە ڕێکەوت؛ بە هەڵکەوت؛ ناگا؛ لەپڕ؛ گزوگومەت ‹اتفاقی چشمم افتاد بە ویترین مغازە: بەڕێکەوت ویترینی دووکانەکەم کەوتە بەرچاو›.

**اتکـا** / ettekā'/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی پاڵدان؛ پشتدان؛ پاڵ پێوەدان.

◙ **اتکای به نفس** ☜ **اتکابەنفس**

◙ **اتکا کردن:** پشت بەستن؛ پاڵدانەوە؛ پاڵ پێوەدان؛ پشتدان؛ پشتدانەوە. هەروەها: **اتکا داشتن**

**اتکابـەنفس** / ettekā-be-nafs'/: [عربی/ فارسی/ عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی بە خۆدا پەرمیان؛ لە خۆڕا دیتن؛ بە خۆ ڕاپەرموون؛ پەرمەی وێرە؛ لە خۆ دیتنەوە؛ هومێدواری و پشتگەرمی بە هێز و توانایی و لێهاتوویی خۆ: **اتکای به نفس**

**اتکال** / ettekāl'/: [عربی]/اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی پشت پێ‌بەستن؛ پشت پێ‌بەستنەوە؛ خۆ پێ بەستنەوە ‹اتکال به خدا: پشت بە خودا بەستنەوە›.

**اتـلاف** / etlāf'/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی لەکیس دان؛ بە فیڕۆدان؛ مەزخان.

◙ **اتـلاف وقـت:** کات بە فیڕۆدان؛ لە

دەس‌دانی وەخت؛ لەکیس‌دانی کات و سات.

**اتلال** / atlāl'/: [عربی] جمعِ ☜ **تَل**

**اتلس** / atlas'/: [معرب از یونانی]/اسم. ئەتلەس: ۱. جۆرێ قوماشی هەورێشمی ۲. /ـها/ گۆڤاری وێنە و نەخشەی تایبەت بە جوگرافی * **اطلس**

◙ **اتلس زربفت / زرکار / زری**: ئەتلەسی زەری؛ جۆرێ قوماشی ئەتلەسی کە زەری تێ‌چاندرابێ.

**اتلسی**[1] / atlasî'، ـها/: [معرب از فارسی]/اسم. ئەتلەسی: ۱. گۆچان‌قەند؛ جۆرێ ئاونەوات ۲. گوڵە حەریرە؛ گولبۆری؛ گوڵی ئەتلەسی؛ گوڵێکی جوانە کە لە شەودا زۆر بۆنخۆشە *اطلسی

**اتلسی**[2]: صفت. ئەتلەسی؛ وەکوو ئەتلەسی؛ ئەتلەسی چەشن؛ ئەتلەسی ئاسا: **اطلسی**

**اتل‌متل توتوله** / atal-matal-tutûle'/:/اسم. هەتۆڵ ـ مەتۆڵ؛ هەتۆڵ ـ مەتۆڵ؛ هەلوور ـ بلوور؛ حلوور ـ بلوور؛ حللوور ـ بللوور؛ گەمەیەکی منداڵانە، لە دەوری یەک دادەنیشن و لاق ڕادەکێشن، وەستا شێعرێک دەخوێنێتەوە و بە نۆرە دەور دەداتەوە، هەرکامێک نۆرەی هات و دەست لە لاقی درا، دە بێ لاقی بکێشێتە دواوە، تا لە ئاخرەوە لاقی کێ مایەوە، ئەوە دۆڕاندوویە.

**اتم** / atam(m)'/: [عربی] صفت. [ادبی] تەواوتر؛ تەواوەتی؛ تەلەک تەواو؛ بە تەواوەتی؛ تەواوی تەواو.

**اتم** / atom'، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ئەتوم؛ بچووکترین پاژی هەر شتێ: **آتُم**

**اتمام** / etmām'/: [عربی]/اسم. دوایی؛ کۆتایی؛ ڕەو؛ بوخت؛ کار یان ڕەوتی کۆتایی پێ هێنان ‹کار ما اتمام یافت: کاری ئێمە کوتایی هات›.

◙ **اتمام حجت کردن**: ڕامل خستن؛ قسە نەهێشتنەوە؛ قسەی ئاخرکردن؛ دواترین قسە و ڕاوێژگوتن و درگای وتووێژ داخستن.

**اتمسفر** / atmosfer'/: [فرانسوی] ☜ **آتمُسفِر**

**اتمی** / atomî'/: [فرانسوی] صفت. ئەتومی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئەتوم ‹بمب اتمی: بومبی ئەتومی›.

**اتنولژی** / etnolojî'/: [فرانسوی]/اسم. خەڵک‌ناسی؛ مەردم‌ناسی؛ هۆزناسی؛ لقێ لە زانستی مرۆناسی کە لە ڕەچەڵەک، پێوەندی ئاقاری و کۆمەڵگایی و زمان و فەرهەنگی کۆمەڵگاکانی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە.

**اتو** / utû, 'otû'، ـها/: [ترکی]/اسم. ئوتۆ؛ ئوتوو؛ وتوو؛ تووز؛ چرچ لابەر؛ جل سافکەر؛ دەقاق؛ کەرەسەیەکە بە پەرەیەکی ساف و کانزاییەوە بۆ لابردنی لۆچی قوماش: **اطو**

◙ **اتوی بخار**: وتووی هەڵمین؛ ئوتۆیەک کە جێگای تایبەتی ئاوی هەیە و خۆی هەڵم دروست دەکا.

**اتوی برقی**: ئوتووی بەرقی؛ دەقاقی کارەبایی. هەروەها: **اتوی زغالی**

◙ **اتو خوردن**: ۱. ساف بوون؛ بێ‌چرچ و لۆچ بوون ۲. [مجازی] ژێر بوون؛ هاتنە سەربار؛ دەست لە چەوتی هەڵگرتن.

**اتو زدن**: [گفتاری] وتوو کردن؛ وتوو لێدان؛ ئوتوو کێشان؛ ئوتوو ماڵین.

**اتو کردن**: وتووکردن؛ ساف‌کردن؛ لا بردنی چرچ و لۆچی جل و بەرگ بە ئوتوو.

**اتو کشیدن**: وتوو کێشان؛ دەقاق دان.

**اتوبان** / otobān'، ـها/: [آلمانی]/اسم. گەورەڕێ؛ شاڕێ.

**اتوبوس** / otubûs, 'otobûs'، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پاس؛ ئوتوبووس؛ ماشێنی گەورەی

جێبەجێ کردنی خەڵک.

▣ **اتوبوس برقی**: پاسی کارەبایی؛ پاسێ کە لە سەر هێڵی ئاسن و بە وەرگرتنی هێز لە تەلی کارەبایەوە کە لە بانیەوە کێشراوە دەکەوێتە ڕێ: **تراموا؛ تراموای**

**اتوبوس دوطبقە**: پاسی دوونهۆمی؛ پاسێ کە دوو دیوی لە سەر یەکەوە هەبێ.

**اتوبوس واحد**: پاسی ناوشاری؛ پاسێ کە لە ناو شاردا خەڵک جێبەجێ دەکا.

هەروەها: **اتوبوس شهری؛ اتوبوس بیابانی**

**اتوبیوگرافی** / 'otobiyog(e)rāfî /: [فرانسوی] /اسم. بەسەرهاتنووسی؛ ژیننامەنووسی؛ ژیاننامەنووسی؛ کاری نوسینی ژیاننامەی خۆ.

**اتوپیا** / 'otopiyā /: [انگلیسی از یونانی] /اسم. کەسنەزاناوا؛ ئوتۆپیا؛ شاری ئاواتان؛ شارمازن.

**اتوپیست** / 'otopîst ، ـها/: [انگلیسی از یونانی] صفت. ئوتۆپیست؛ لایەنگری پێکهاتنی کۆمەڵگای ئارمانی؛ بە ئاواتی شاری ئاواتان.

**اتوپیسم** / 'otopîsm /: [انگلیسی از یونانی] /اسم. ئوتۆپیسم: ۱. بڕوا بە ڕەخساندنی کەسنەزاناوا ۲. هزرپەروەری لە بوارگەلی ڕامیاری و ئابووریدا.

**اتوتروف** / 'otot(e)rof ، ـها/: [انگلیسی] صفت. *[زیستشناسی]* ئوتۆتروف؛ بە تایبەتمەندی و توانایی گرتن و سازکردنی خواردەمەنی لە خاک (وەک شینایییەکان).

**اتوتومی** / 'ototomî /: [انگلیسی] /اسم. *[زیستشناسی]* خۆبڕی؛ تایبەتیەک لە بڕێک گیانلەبەراندا کە کاتی هەست بە مەترسیدا دەتوانن بەشێک لە لەشیان ببڕن و بەجێبێڵن (وەک مارمزووک).

**اتوخورده** / utûxorde, 'otû- /: [ترکی/ فارسی] صفت. دەقکراو؛ ئوتووکراو؛ دەقاقکراو؛ جل و بەرگێک کە بە وتوو ساف و لووس کرابێ.

**اتود** / 'etûd ، ـها/: [فرانسوی] /اسم. ۱. کاری چاو پێدا خشاندن ۲. گەڵاڵە دارشتن؛ کلاڵە دادان ۳. تەمرین (بەتایبەت ڕاهاتن لە نیگارکێشیدا).

**اتوریتریانیسم** / 'otoriteryānîsm /: [فرانسوی] اسم. *[سیاست]* دەسەڵاتخوازی؛ دەگەرخوازی.

**اتوریته** / 'otorîte /: [فرانسوی] /اسم. دەسەڵات؛ دەسچوویی ڕامیاری.

**اتوشویی** / 'utûšûyî, 'oût- /: [ترکی/ فارسی] /اسم. وتووشۆری: ۱. کاری شۆردن و وتووکێشی جلوبەرگ و... بە ماشێن ۲. /ـها/ کارگایەک کە تێیدا شۆردن و وتووکێشی بە ماشین ئەنجام دەدرێ.

**اتوکار** / 'otokār ، ـها/: [فرانسوی] /اسم. ئوتووبووس؛ پاس.

**اتوکار** / 'utûkeš, 'otû- /: [ترکی/ فارسی] ☜ **اتوکش**

**اتوکراسی** / 'otok(e)rāsî ، ـها/: [فرانسوی] اسم. *[سیاست]* خۆسەری؛ ملهوڕی؛ بێسنوور بوونی هێزی فەرمانڕەوا لەکردەوەدا.

**اتوکش** / 'utûkeš, 'otû- ، ـها/: [ترکی/ فارسی] /اسم. وتووکێش؛ کرێکارێ کە کاری وتوو کردنی جلک و پارچەیە.

**اتوکشی** / 'utûkešî, 'oût- /: [ترکی/ فارسی] /اسم. ئوتووکێشی؛ وتووکێشی.

**اتوکشیده** / 'utûkešîde, 'otû- /: [ترکی/ فارسی] صفت. *[کنایی]* ۱. دەقکراو؛ ساف و ڕێک؛ بێچرچ و لۆچ ‹لباس اتوکشیده: جلکی ساف و ڕێک› ۲. /ـها/ بەدەق؛ خاوەن جلک و سەر و رووی ڕێک و پێک ‹آدم اتوکشیده: مرۆی بەدەق›.

**اتوکلاو** / 'otok(e)lāv ، ـها/: [فرانسوی] /اسم. ئوتۆکلاو؛ کەرەسەی میکرۆب کوژی بە هەڵمی زۆر داخ.

**اتومات** / otomāt'/: [فرانسوی] *صفت*. خۆکار؛ خۆمەش؛ خۆگەڕ؛ ئوتۆمات.

**اتوماتیک** / otomātîk'/: [فرانسوی] *صفت*. خۆمەش؛ خۆگەڕ؛ خۆکار؛ ئوتۆماتیک.

**اتوماسیون** /otomās(i)yon/: [فرانسوی] /*اسم*. ئۆتۆماسیۆن؛ کار یان ڕەوتی خۆ کارکردن.

**اتومبیل** / otom(o)bîl'، ـها/: [فرانسوی]/*اسم*. گەڕۆک؛ ترومبێل؛ ترومبیل؛ ماشین؛ ماشێن؛ ماکینە؛ سەیارە؛ کەرەستەی گواستنەوەیی چەرخدار کە بە سەر زەویدا دەڕوات و بۆ هەڵگرتن و بردنی مرۆڤ و بار چێ‌کراوە.

◘ **اتومبیل باری**: ترومبیلی باری؛ گەڕۆکی باری؛ ماشێنێ کە بۆ هەڵگرتنی بار دەشێ.

**اتومبیل سواری**: ترومبیلی سواری؛ گەڕۆکی سواری؛ ماشێنی بچووک، بۆ هەڵگرتنی کەمتر لە دە کەس.

**اتومبیل شخصی**: گەڕۆکی کەسی.

**اتومبیل شکاری**: ترومبیلی ڕاو؛ گەڕۆکی ڕاو؛ ماشێنی ڕاو.

**اتومبیل کرایه**: ترومبیلی کرێ؛ گەڕۆکی کرێ.

**اتومبیلرانی** / otom(o)bîlrānî'/: [فرانسوی/ فارسی]/*اسم*. گەڕۆک ئاژۆیی؛ گەڕۆک لێ‌خوڕی؛ ترومبیل لێ‌خوڕی.

**اتومبیلرو** / otom(o)bîlrow'/: [فرانسوی/ فارسی] *صفت*. ماشێنڕۆ؛ شوێنی شیاو یا تایبەت بۆ هاتوچووی ترومبیل.

**اتومبیلسازی** / otom(o)bîlsāzî'/: [فرانسوی/ فارسی]/*اسم*. گەڕۆکسازی؛ ترومبیلسازی: ۱. ڕەوتی درووس کردنی گەڕۆک ۲. کار یا پیشەی ترومبیلساز ۳. /ـها/ کارخانەیەک کە تێیدا گەڕۆک درووس دەکەن.

**اتهام** / ettehām'، ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم*. گزنی؛ بوختیان؛ بوخت؛ بوختان؛ هەڵە یان سووچێک کە دەیدەنە پاڵ کەسێکەوە و هێشتا بەڕاست دەرهاتنی ڕوون نەبۆتەوە.

◘ **اتهام زدن**: تاوانبارکردن؛ گزنی هەڵبەستن؛ بوخت لێدان؛ بوخت بە کۆڵدادان؛ بوختیان کردن؛ تۆمەت لێدان؛ بوختیان هەڵوەستن؛ بوخت چنین.

**اتهام وارد بودن**: بوختان چەسپان؛ ڕەوا ناسینی بوختیان لە لایەن پێگەیێکی ڕەسمیەوە.

**اتهام وارد کردن**: بوختیان بۆ کردن؛ لەیەک ناوەندی ڕەسمیەوە تاوانبارکردن.

هەروەها: **اتهام وارد شدن**

**اتیکت** / etîket'/: [فرانسوی]/*اسم*. ۱. بەرنووسەک؛ بەرچەسپ ‹اتیکت قیمت: بەرنووسەکی نرخ› ۲. خووی هۆرتەوبەرە؛ خووی هەڵس‌وکەوت؛ ڕێ‌وشوێنی هەڵس و بنیش.

**اتیمولژی** / etîmolojî'/: [فرانسوی]/*اسم*. *[زبان‌شناسی]* ڕەگناسی؛ ڕیشەناسی.

**اثاث** / asās'/: [عربی]/*اسم*. کەل‌وپەل؛ کەلپەل؛ پرتاڵ؛ پیتۆڵ؛ ماتول؛ خرپڕ؛ خرووپڕ؛ هێرک؛ ئەسپابات ‹اثاث خانە: کەلپەلی ماڵ›.

**اثاث‌کشی** / asāskešî'، ـها/: [عربی/ فارسی] /*اسم*. ئەسپاوکێشی؛ کەلپەل گواستنەوە.

**اثاثه** / asāse'، اثاث/: [عربی]/*اسم*. *[ادبی]* کەل‌وپەل؛ کەلپەل؛ ناوماڵ؛ خرت و پرت؛ ئەساسیە.

**اثاثیه** / asāsîyye'/: [عربی]/*اسم*. کەل‌وپەل؛ کەلپەل؛ پرتاڵ؛ پیتۆڵ؛ ماتول؛ خرپڕ؛ خرووپڕ؛ هێرک؛ ئەسپابات.

◘ **اثاثیه‌ی بَنجَل**: پوخڵەوات؛ خڕ و خەگول؛

قەرەقۆت؛ خرت و پرتی بێنرخ.
**اثاثیەی خانە:** پرتاڵ؛ هێرک؛ هێزەک؛ ناوماڵە؛ کەلوپەلی ناوماڵ؛ ئەسپاوی ناوماڵ.
**اثاثیەی سبک:** مردە ماڵ؛ بڕێ لە ئەسپاباتی ناوماڵ کە هاسان بار دەکرێن.
**اثاثیە و آذوقەی خانە:** تڕوتفاق؛ کەلوپەل و ئازۆقەی ماڵ.
**اثبات** /'esbāt/: [عربی]/سم. کار یان ڕەوتی سەلماندن؛ چەسپاندن؛ ڕوون کردنەوەی دروستی بابەتێک بە چەشنێ کە (زۆتر) بۆ کەسانی تر جێبڕوا بێ.
◘ **اثبات شدن:** سەلمیان؛ سەلمان؛ چەسپان.
**اثباتاً** /'esbātan/: [عربی] قید. بە ئەرێنی؛ بە سەلمیاوی؛ بە شێوەی چەسپاو؛ بە جێگر بوون ‹نتیجەی بررسی را نفیاً یا اثباتاً اعلام فرمایید: ئاکامی لێکدانەوەکە بە نەرێنی یان ئەرێنی ئاراستە کەن›.
**اثر** /'asar/، ـها؛ ـات؛ آثار/: [عربی]/سم. ١. شۆ؛ شوێن؛ شۆپ؛ شۆب؛ شوون؛ شوێنەوار؛ شۆنەما؛ شۆنەمەی؛ ئالگ؛ مەئەر؛ نونگ؛ یافت؛ نیشان؛ شۆن و بەر؛ ڕێنج؛ ئاسەوار؛ نیشانێک کە لە شتێک یان بە ڕووی شتێکەوە دەمێنێتەوە ‹اثر زخم: شوێنی برین› ٢. بەرهەم ‹اثر ادبی: بەرهەمی ئەدەبی› ٣. ئاسەوار؛ شوێنەوا؛ شۆنەما؛ شۆنەمەی؛ ئەو شتەی کە بەجێماوە ‹اثر تاریخی: ئاسەواری مێژوویی› ٤. ئەسەر؛ شوێنەوا؛ ئەو شتە کە دەبێتە هۆی پەیدا بوونی گۆڕان لە چەندیەتی یان چۆنیەتیدا ‹اثر دارو: شوێنەوای دەرمان› ٥. فایدە؛ کارایی ‹گریە و زاری اثر ندارد: ناڵە و گریان و شیوەن فایدەی نیە›.
◙ **اثر ادبی:** بەرهەمی ئەدەبی؛ ئاسەواری ئەدەبی؛ نووسراویەک (وەکوو چیرۆک یا شێعر) کە بایەخ یان ناوەرۆکێکی وێژەیی هەبێ. هەروەها: **اثر دینی؛ اثر علمی؛ اثر فلسفی**
**اثر انگشت:** شۆن قامک؛ شۆتل؛ شۆن تل؛ شۆپل؛ شۆن پل؛ شۆن کلک؛ شوێنی وردەهێڵگەلی سەر پێستی قامک بەتایبەت کاتێ بە مەرەکەب نرابێتە بان کاغەز یان شتێ‌ترەوە کە زۆرتر بۆ ناسینەوەی خاوەنەکەی بەکەڵکە.
**اثر باستانی:** کەون ئاسەوار؛ ئاسەواری دێرینە؛ کەلوپەل یان ئاسەوارێکی هونەری پێوەندیدار بە سەردەمانی ڕابردوو (بەر لە ئیسلام یان بەر لە زایین).
**اثر تاریخی:** ئاسەواری مێژوویی؛ شوێنەواری مێژینەیی؛ هەرشتێ (وەک سکە، کتیبە، کەلوپەل، بەتایبەت خانووبەرە)ی پێوەندیدار بە سەردەمێکی مێژوویی دیاریکراوەوە.
**اثر حجمی:** هەتیال؛ هەیکەل؛ پەیکەر؛ کۆتەڵ.
**اثر سینمایی:** ١. فیلمی سینەمایی ٢. فیلمنامە.
**اثر طبیعی:** شۆنی سروشتی؛ شوێنەواری خۆڕسکی؛ دیاردەیەکی سروشتی سەرسووڕێنەر و بەدەگمەن (وەک ئەشکەوت، تاڤگە، فوارە و...).
**اثر نقّاشی:** بەرهەمی نیگارکێشی؛ ئەو ئاسەوارەی نیگارکێش بەدیهێناوە.
**اثر نمایشی:** ١. فیلم؛ شانۆ ٢. شانۆنامە.
**اثر هنری:** بەرهەمی هونەری (وەکوو: پەیکەر، نەخش، نیگار، مووسیقا و...).
◘ **اثر بخشیدن:** کارتێکردن؛ کاریگەر بوون؛ کارکۆیی بوون ‹چند دقیقە بعد دارویش اثر بخشید و دردش ساکت شد: پاش ساتێ دە واکە

کاری‌تیکرد و ئیشەکەی دامرکا›.

**اثر پذیرفتن:** وەخۆگرتن؛ کار پەژیران؛ بوون لە بەرانبەر گۆڕانی چەندی یان چۆنی بە هۆی کارتێکەری شتێکەوە.

**اثر داشتن:** کاریگەر بوون؛کارکۆ بوون ‹هر چه گفتم هیچ اثری نداشت: هەر چێکم گوت، هیچ کاریگەر نەبوو›.

**اثر کردن/ گذاشتن:** کارتێکردن ‹حرفهایش در من خیلی اثر کرد: وتەکانی زۆریان کار تیکردم›.

**اثربخش** / asarbaxš'/: [عربی/ فارسی] *صفت.* کارتێکەر؛ کاریگەر؛ کارکۆ؛ گۆڕێنەر لە چەند و چوونیدا ‹درمان اثربخش؛ سخن اثربخش: دەرمانی کاریگەر؛ قسەی کاریگەر›.

**اثربخشی** / asarbaxšî'/: [عربی/ فارسی]*اسم.* کاریگەری؛ کارتێکەری؛ کارکۆیی؛ کار یان ڕەوتی کاریگەر بوون و کارتێکردن ‹میزان اثربخشی این دارو در بیماران مختلف است: ڕادەی کاریگەری ئەم دەرمانە لە نەخۆشاندا جۆراوجۆرە›.

**اثرپذیر** / asarpazîr'/: [عربی/ فارسی]*اسم.* کارپەژیر؛ کار وەخۆگر ‹انسان در کودکی و جوانی بیشتر اثرپذیر است: مرۆڤ لە منداڵی و لاوەتیدا، زۆرتر کارپەژیرە›.

**اثرپذیری** / asarpazîrî'/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کارپەژیری؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی گۆڕان بە هۆی شتێکەوە ‹اثرپذیری افراد در مقابل یک پیام معین، متفاوت است: کارپەژیری هەر کەس لە بەرانبەر پەیامێکی دیاریکراودا جیاوازە›.

**اثرگذاری** / asargozārî'/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کاریگەری؛ کارتێکەری ‹باید دید میزان اثرگذاری برنامەهای تلویزیون چقدر است: دەبێ بزانین ڕادەی کاریگەری بەرنامەگەلی تەلەڤیزیۆن چەندە›.

**اثنا** / asnā'/: [عربی]*اسم.* مەودا؛ نێوان؛ ماوە؛ گاف؛ کاتی نێوان سەرەتا و سەرەنجامی ڕەوتێک یان هەبوون لە نێوان دوو ڕووداودا ‹در اثنای کار دستش زخمی شد: لە نیوان کاردا دەستی بریندار بوو›.

▣ **در اثنای** ☜ **در**[۲]

**در این اثنا** ☜ **در**[۲]

**اثناعشر** / asnāašar, 'asnā'ašar'/: [عربی] *اسم.* ۱. *[نامتداول]* دوازدە؛ دەوازدە ۲. *[کالبدشناسی]* دوازدەیینە؛ داوزدە سانتی هەوەڵی ڕیخۆڵەی بچووک: **اثنیعَشَر**

**اثناعشری** / asnāašarî,'asnā'ašarî'/: [عربی] ☜ شیعەی اثناعشری، **شیعه**

**اثنیعشر** / asnāašar'/: [عربی] ☜ **اَثناعَشَر**

**اثیر** / asîr'/: [معرب از یونانی]*اسم.* *[قدیمی]* ترووسکەی شیر؛ گۆی ئاگرینێک کە گومان دەکرا لە سەر کەشی زەویندایە.

**اثیری** / asîrî'/: [معرب] *صفت.* *[مجازی]* تراو؛ تەڕ؛ گەڕۆک و نادیار.

**اج** / ac,'oc'/: هـا/:*اسم.* *[نامتداول]* ۱. کوولەکەسەراوی؛ کۆندکی ئاوی؛ کولند ۲. گۆزە یان دەفرێک کە لە کوولەکەسەراوی ساز دەکرێ.

**اجابت** / ecābat'/: [عربی]*اسم.* ۱. وەڵامدەری؛ پەرسڤدەری؛ بەرشۆدەری؛ جواوگۆیی؛ جوابدەری ۲. قەبووڵ؛ پەزێرین؛ بوارایی.

▣ **اجابت دعا:** وەرام دانەوەی نزا؛ وەکەرەم کەوتنی دوعا؛ پەزێرانی نزا ‹دعا از ماست و اجابت دعا از خدا: نزا لە مەیە و وەرام دانەوەی نزا لە خودایە›.

**اجابت مزاج:** زگ کارکردن؛ کارکردنی زگ؛ کارکردنی گەوو ‹دو روز است که اجابت مزاج نداشته: دوو ڕۆژە زگی کاری نەکردووە›.

▣ **اجابت شدن:** وەکەرەم کەوتن؛ وەرام

درانەوە؛ قەبووڵ بوون؛ دەرچوون؛ دەرهاتن ‹دعایش اجابت شد و خدا به او پسری داد: نزای وەکەرەم کەوت و خوا کوڕێکی پێدا› .

**اجابت کردن:** ١. بواراکردن؛ قەبووڵ کردن؛ وە بەردڵکەوتن؛ پەزیران ٢. بەجێ هێنان ‹تقاضای مرا اجابت کرد: داخوازیەکەی منی بە جێ هێنا›.

**اجاره** / ecāre'/: [عربی]/اسم. کرێ؛ کراهە؛ کرایە؛ کرێها؛ کرا؛ کرها؛ کراها: ١. مافی کەلک وەرگرتن لە جێ یان شتێک لە بەرانبەر پێدانی پارەیەکی دیاریکراو لە کاتێکی دیاریکراودا ٢. *[فقه]* پەیمانێک کە دەبێتە هۆی ئەوە کرێگیر مافی بەهرە وەرگرتن لە بابەتی کرێگیراوەکەی ببێ و لەوە بەولاوە دەبێتە خاوەنی قازانج و بەرهەمی ئەو شتە ٣. *[ـها/ [گفتاری]* نرخی کرێ؛ بایی ئیجارە ‹اجاره‌اش چقدر است؟: کرێکەی چەندە؟›.

▣ **اجاره دادن:** بە کرێ‌دان؛ کرها دان؛ کرادان ‹خانه را اجاره دادیم: ماڵەکەمان بەکرێ داوە›.

**اجاره‌ای** / ecāre'î/: [عربی] صفت. ١. کرهایی؛ کرێیی ٢. ئیجارەکراو؛ کرێ‌گیراو.

**اجاره‌بها** / ecārebahā'/: [عربی/ فارسی]/اسم. کرێ؛ کرها؛ کراها؛ نرخی‌کراها؛ بایی‌کرێ.

**اجاره‌دار** / ecāredār'، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. کرهادار؛ کرادار؛ کرێدار؛ کرێهادار؛ کرێدەر.

**اجاره‌داری** / ecāredārî'/: [عربی/ فارسی] /اسم. کراداری؛ کرهاداری؛ دۆخ یان چۆنیەتی کراهەدار بوون ‹از اجاره‌داری درآمد خوبی دارد: لە کراداری داهاتی باشی هەیە›.

**اجاره‌نامچه** / ecārenāmče'، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[گفتاری]* کرهانامە؛ کرانامە؛ قەواڵەیەک کە ڕاڤە و مەرجی کرێی تێدا نووسراوە.

**اجاره‌نامه** / ecārenāme'، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. کرهانامە؛ کرانامە؛ ئەو بەڵگە کە ڕاڤە و مەرجگەلی چۆن بەکرێدانی تێدا نووسراوە.

**اجاره‌نشین** / ecārenešîn'، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. کرێ‌نشین؛ ماڵگر؛ کرێهانشین؛ کرانشین؛ کرێگرتی؛ کرێچی؛ ئیجارەنشین؛ کەسێ کە لە خانووی ئیجارە دادەنیشێ؛ کەسێ کە لە جێگایەکی کرێ دراو نیشتەجێیە.

**اجازات** / ecāzāt'/: [عربی] ١. جمعِ ☜ **اجازه** ٢. جمعِ ☜ **اجازت**

**اجازت** / ecāzat'، اجازات/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* بەرایی؛ ئیزن؛ ئیجازە؛ بوار.

**اجازه** / ecāze'، اجازات/: [عربی]/اسم. بەرایی؛ بوار؛ ئیجازە: ١. ئیزن؛ مافێک کە بەرپرس یان خاوەن ماف بۆ ئەنجامدانی کارێ بە کەسێکی‌تری دەدات ‹اجازه‌ی ورود: بەرایی هاتنە ژوور› ٢. ڕەوا زانین؛ سازانی بەرپرس یان خاوەن ماف لەگەڵ کردەوەیەکدا کە بە دەستی ئەو یان لە دەربەستی ئەودایە ‹اجازه‌ی فروش: بەرایی فرۆش›.

▣ **اجازه‌ی فتوی:** وەجەر؛ دەستوور؛ فەرمان؛ فتوا؛ فەرمانێک کە بە پێی، خاوەن فەرمان ڕێی هەیە فتوا بدا.

▣ **اجازه خواستن:** بەرایی خواستن؛ ئیزن خواستن؛ ئیجازە خوازین؛ ڕاخواستن ‹اجازه می‌خواهم در این باره صحبت کنم: بەراییم دەوێ لەم بارەوە قسە بکەم›.

**اجازه دادن:** بەرایی پێدان؛ بەرایی دان؛ ڕێدان؛ هێشتن؛ ئاسەی؛ ئاستەی؛ هێلان؛ هێلان؛ ڕێگەدان؛ ئیجازەدان؛ ڕادان؛ بواردان؛ ڕەوا دین؛ ڕەوا زانین ‹به شما اجازه می‌دهم از خودتان دفاع کنید: بەراییتان

پیدەدەم کە لە خۆتان باشاری بکەن›.

**اجازه داشتن**: بە بەرایی بوون؛ بەرایی هەبوون.

**اجازه گرفتن**: بەرایی گرتن؛ ئیزن گرتن: **اجازه یافتن**

**اجازه یافتن** ☜ **اجازه گرفتن**

**اجازەنامه** / 'ecāzenāme، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پەروانە؛ بەرایی‌نامە؛ ئیزن‌نامە؛ جەواز ‹اجازەنامەی کار: بەرایی‌نامەی کار›.

**اجاق** / 'ocāq/: [ترکی]/اسم. ۱. /ـها/ کوانوو؛ کوانک؛ کولانێ؛ کۆنە؛ کوونە؛ تەژگا؛ تەشگا؛ تفک؛ ئاگردان؛ قاو؛ جاخ؛ وەجاخ؛ وجاخ؛ ئاورگ؛ ئارگا؛ تەفایە؛ ئاگردانی موبەق؛ کوچک؛ کوچکە؛ کوچک و کوانک؛ ئایەردان؛ ئامرازی گەرمەو کردن یان لێنانی چێشت ۲. /مجازی/ وجاخ؛ ڕەتەوە؛ ڕەچەڵەک؛ بنەماڵەی زۆر ڕەسەن ‹اجاق کور: وجاخ کوێر› ۳. باوەلێ؛ سەهید؛ شێخ ‹او در ولایت ما بە اجاق معروف بود: لە وڵاتی مەدا بە باوەلێ دەناسرا› ٤. قسن؛ شەخس؛ نەزەرگە؛ گۆڕی باوەلێ؛ گۆڕی شێخ.

▣ **اجاق برقی**: کوانووی بەرقی.

**اجاق سنگی**: ئاتەشخان؛ کوانوو؛ سێ کوچکە؛ ئارگا؛ قوڵکەی ژێر تیانە کە ئاگری تێدا دەکەنەوە.

**اجاق گاز** ☜ **اجاق‌گاز**

**اجاق‌روشن** / 'ocāqrowšan, -ro:šan، ـها/: [ترکی/ فارسی] صفت. فەرزەندار؛ وجاخدار؛ وجاخ ڕۆشن؛ فەرزەنیار؛ خاوەن منداڵ و فەرزەند بە تایبەت خاوەن کوڕ؛ بەرانبەری وجاخ‌کوێر.

**اجاقک** / 'ocāqak، ـها/: [ترکی/ فارسی]/اسم. کوانووی کارەبایی؛ ئامێری کولاندن، کە بە هێزی کارەبا گەرم دەبێتەوە: **هیتر**

**اجاق‌کور** / 'ocāqkûr، ـها/: [ترکی/ فارسی] صفت. وجاخ کوێر؛ وەجاخ کوڕ؛ ئوجاخ‌کوێر؛ بێ‌منداڵ؛ وارونداء؛ وارکۆر؛ شۆرک؛ بێ‌کوڕ.

**اجاق‌گاز** / 'ocāqgāz، ـها/: [ترکی/ فارسی] /اسم. ئوجاخ‌گاز؛ کوانووی گازی؛ وجاخێ کە بە گاز دەگرێ.

**اجامرواوباش** /'acāmer-o-'owbāš, -'o:bāš/: [عربی]/اسم. لاتولووت؛ خۆڕیوتۆڕی؛ خوێڕی؛ لات و بەرەڵا؛ گەجەرگوجەر؛ خەڵکی وێڵەکی و هەرزە کە ئاکاری دژ بە کۆمەڵگەیان هەبێت.

**اجانب** / 'acāneb/: [عربی] جمعِ ☜ **اَجنَبی**[1]

**اجبار** / 'ecbār/: [عربی]/اسم. زۆرەکی؛ بەزۆر؛ خورتی: ۱. کاریێ بە کەسێ کردن بە زۆر یان گوشار و لاپارەوە ‹بچەهای مدرسه را بە اجبار بە تظاهرات می‌بردند: منداڵانی قوتابخانەیان بەزور بۆ خۆپیشاندان دەبرد› ۲. ناچاری؛ بە زۆری؛ ناعیلاجی ‹از روی اجبار بە فروش خانەاش رضایت داد: لە ناچاری بۆ فرۆشی ماڵەکەی ملی دانەواند›.

**اجباراً** / 'ecbāran/: [عربی] قید. ناچار؛ بە زۆراتی؛ بە زۆرەکی؛ بە زۆرەملی؛ بە زۆرەملێ؛ بەخورتی؛ بە زۆر؛ بە ناچار؛ بە ناعیلاجی؛ لە ناعیلاجی ‹اجباراً خانە را فروختم: ناچار ماڵەکەم فرۆشت›.

**اجباری**[1] / 'ecbārî/: [عربی]/اسم. /گفتاری، مجازی/ سەروازی؛ خزمەتی سەربازی ‹پسرش را بردند اجباری: کوڕەکەیان بردە سەروازی›.

**اجباری**[2]: صفت. زۆرەکی؛ بەزۆری؛ بەخورتی؛ زۆرانی؛ زۆرەملێ؛ ناچاری؛ ناعیلاجی ‹اقامت اجباری: نیشتەجێ بوونی زۆرەکی›.

**اجتماع** / 'ectemā'/: [عربی]/اسم. کۆ؛ چڤات؛ بەراقی؛ کۆڕ؛ جوات؛ جڤین؛ شەماتە؛ ئاپۆرە؛ کهان؛ گهان؛ کۆمەڵە؛ کۆگا؛ کۆما؛ کوا؛

پسات: ١. خڕ؛ کۆم؛ تۆق؛ گرد؛ کار یان ڕەوتی کۆوە بوون لە جێگایەک ‹دانش‌آموزان در جلو مدرسه اجتماع کرده بودند: قوتابیەکان لەبەر قوتابخانەدا کۆ ببوونەوە› ٢. /ـها؛ ـات/ کۆ بوونەوە؛ گرۆیێ کە لە شوێنێک خڕ بوونەتەوە ‹مخالفان، اجتماع دانشجویان را بە آشوب کشاندند: نەیاران ئاژاوەیان خستە ناو کۆ بوونەوەی خوێندکارانەوە› ٣. /ـها؛ ـات/ کۆمەڵە؛ کۆمەڵگا؛ کۆمەڵپسات؛ گەل؛ ئاپۆرە ‹اجتماع آزاد: ئاپۆرەی ئازاد›.

**اجتماعی** / 'ectemā'î/: [عربی] *صفت*. کۆمەلایەتی؛ جڤاتی؛ کۆمەیی؛ ئاپۆرەیی: ١. سەر بە ئاپۆرە ‹نهادهای اجتماعی: بنکەگەلی کۆمەلایەتی› ٢. کەسێ یان شتێ کە خۆ و خدەی ژیان بردنە سەری لەگەڵ هیتران و لە نێوان کۆمەلاندا هەیە ‹مورچەهای اجتماعی: میروولەگەلی ئاپۆرەیی› ٣. هۆگر بە هاونشینی لەگەڵ دیتران ‹آدم اجتماعی: مرۆی ئاپۆرەیی› ٤. هۆگر بە قازانج و بابەتگەلی ناو کۆمەڵگا ‹شخصیت اجتماعی: کەسایەتی کۆمەلایەتی›.

**اجتناب** / 'ectenāb/: [عربی]/*اسم*. دوورەپەرێزی؛ کەنارەگیری؛ دووری؛ ئیتلیس؛ کار و ڕەوتی تلماسانەوە.

⊡ **اجتناب کردن:** خۆ پاراستن؛ دووری گرتن؛ قەراخ گرتن؛ تلماسینەوە ‹باید از خوردن غذای مانده اجتناب کرد: دەبێ لە خواردنی چێشتی کۆنە خۆ بپاریزین›.

**اجتناب شدن:** دەس پاراستن؛ پارێزکردن؛ خۆ لادان؛ خۆ لێگرتن؛ تلاسانەوە ‹از بردن کودکان بە مکانهای آلودە اجتناب شود: لە بردنی منداڵان بۆ جێگەگەلی چەپەڵ پارێزکەن›.

**اجتناب‌پذیر** / 'ectenābpazîr/: [عربی/فارسی] *صفت*. دووریلێگر؛ خۆلێلادەر؛ شیاوی خۆ لێلادان. هەروەها: **اجتناب‌ناپذیر**

**اجتهاد** / 'ectehād/: [عربی]/*اسم*. ١. /ـها؛ ـات/ هەڵهێنجانی بابەتگەلی شەرعی لە قورئان و حەدیس ٢. کار یان پیشەی کەسێ کە ئەو کارە دەکا(مەلا) ٣. /ـها؛ ـات/ *[نامتداول]* هەوڵ؛ کۆشش؛ گوزاق؛ کردوکۆش؛ تەپشت.

**اجحاف** / 'echāf، ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم*. ناحەقی؛ ستەم؛ گووچ؛ مافخۆری؛ کردەوەی ناحەق ‹بە او اجحاف شد: ناحەقی لێکرا›.

**اجداد** / 'acdād/: [عربی]/*اسم*. ١. جمعِ ☜ **جَد** ٢. باپیران؛ نەبەتەر؛ باب و کالان ‹اجداد ما کشاورز بودند: باپیرانی ئێمە وەرزێر بوون›.

**اجدادی** / 'acdādî/: [عربی] *صفت*. باب و کالی؛ پشتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە باپیران.

**اجر** / 'acr، ـها؛ أجور/: [عربی]/*اسم*. ئەجر؛ جزیای باش؛ پاداش: ١. پاداشت؛ دەسیاو ٢. مز؛ دەسمز.

⊡ **اجر دادن:** پاداشت دانەوە؛ کەل دانەوە. هەروەها: **اجر یافتن**

**اجرا** / 'ecrā/: [عربی]/*اسم*. بەڕێوەبەری؛ کار یان ڕەوتی ئەنجامدانی کارێ بە پێی گەلاڵە، بەرنامە یان فەرمانێک.

⊡ **اجرای آتش:** تیر هاوێژی؛ کار یان ڕەوتی تیر خستن؛ تیر هاویشتن؛ تەقە کردن.

⊡ **اجرا کردن:** بەڕێ بردن؛ کارکردن بە گوێرەی بیرێ، بڕیارێ یان فەرمانێک: **بە اجرا درآوردن**. هەروەها: **اجرا شدن**

**بە اجرا درآوردن** ☜ **اجرا کردن**

**اجرائی** / 'ecrā'î/: [عربی] ☜ **اجرایی**

**اجرایی** / 'ecrāyî/: [عربی] *صفت*. بەڕێوەبردنی؛ پێوەندیدار یان سەر بە بەڕێوە بردن ‹برنامەی اجرایی: بەرنامەی بەڕێوە

بردنی›: **اجرائی**

**اجرام** / 'acrām/: [عربی] جمعِ ☜ **جِرم**

**اجــرت** / 'ocrat، ـهـا/: [عربـی]/اسـم/ *[قـدیمی]* مز؛ مزدیـه؛ کرێمـا؛ حـەق‌دەس؛ مووچـە؛ خـرە؛ کرێ؛ پـاداش. هـەروەهـا: **اجـرت دادن؛ اجـرت گرفتن**

**اجــرت‌المثــل** / 'ocratolmesl، ـهـا/: [عربـی] *اسـم.* کرێیـــەک هاوقـــاتی ئـــەوەی کـــە لەکرێنامەدا نووسراوە.

**اجــرت‌المــسمی** / 'ocratolmosammā، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. کرێیـەک کـە لـەکـرێنامـەدا نووسراوە.

**اجــرت‌کــاری** / 'ocratkārî/: [عربـی/ فارسـی] *اسـم.* کرێمـــز؛ پـــاشمز؛ کرێکـــاری؛ گـــرتنی مووچـە لـە بـەرانبـەر کـاری ئـەنجـام دراوەوە. بەرانبەر: **مزدکاری**

**اجــر و قــرب** / 'acr-o-qorb/: [عربـی]/اسـم. *[گفتـاری]* رێـز و پلـە؛ ریـز و بـڕ؛ سـەنـگ و رێـز؛ حورمەت؛ قەدر؛ بایەخ؛ ئەرزشت.

**اجــر و مــزد** / 'acr-o-mozd/: [عربـی/ فارسـی] *اسـم. [گفتـاری]* کـرێ؛ مـز؛ دەسمـز؛ حـەقـە زەحمەت؛ حەق و پاداش.

**اجزا** / 'aczā/: [عربی] جمعِ ☜ **جزء**

**اجساد** / 'acsād/: [عربی] جمعِ ☜ **جَسَد**

**اجسام** / 'acsām/: [عربی] جمعِ ☜ **جِسم**

**اجــق‌وجــق** / 'acaqvacaq/: *صـفت. [گفتـاری]* زاق و واق؛ بـــە ڕەنگگـــەلی زەق و چاوبـــەر و پێکهاتەی ناجوور.

**اجــل** / 'acal/: [عربـی]/اسـم. ۱. مـەرگ؛ کـاتی مـــەرگ؛ هـــەلی مـــەرگ؛ دەمـــی مـــەرگ ۲. مەرگ؛ مەری.

◘ **اجـل معلـق:** *[مجـازی]* کوتـەی کـوت‌وپـڕ؛ مەرگی ناوەخت؛ مـەرگـی لـە ناکـاو؛ مـردنی لەپڕ؛ مەرگی کوت‌وپڕ؛ مەرگی بێ‌وادە.

◘ **اجــل کــسی رســیدن:** هـــەلی مـــەرگـــی کەسێک گەیـیـشتن؛ ئـەجـەل/ ئـەنجـەڵـی کەسـێ هـاتن؛ کـاتی مـردنی کـەسـێک هاتن.

**اجــل** / 'acal(l)/: [عربـی] *صـفت.* بـەرێـز؛ هێـژا؛ پایەبەرز؛ زۆر مەزن؛ مازن؛ جێدار؛ گراگر.

**اجــلاس** / 'eclās، ـهـا؛ ـات/: [عربـی]/اسـم. کـۆڕ؛ کـۆنگرە؛ دانیـشتن؛ کـۆ بوونـەوە؛ بـۆ وت و ویـژ و ڕاپرســی دانیــشتن ‹اجــلاس وزیــران: کــۆڕی وەزیران›.

**اجلاســـیه** / 'eclāsîyye، ـهـــا/: [عربـــی]/اسـم. دانیشتگە؛ جێگایەک کە تێیدا کۆ دەبنەوە.

**اجــل‌بــرگــشته** / 'acalbargašte، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت.* مـەرگ هـەڵـپێچاو؛ ئـەنجـەڵ هاتوو؛ تووش بوو بە مەرگی کوتووپڕ.

**اجلــه** / 'acelle/: [عربـی]/اسـم. *[ادبـی]* مـەزنـان؛ گرگران؛ پایـەبـەرزان؛ شـکۆداران؛ گـەورەگـەل؛ کەسانی بە گەورەیی و شکۆ.

**اجمـــاع** / 'ecmā'/: [عربـــی]/اســـم. ۱. *[ادبـــی]* هـــاودەنگـــی؛ هـــاوڕایی؛ هاوداســـتانی ۲. *[فقـه]* باوەڕ پێکـردنی بابـەتێـک لـە لایـەن هـەمـووی موسڵمانانەوە.

**اجماعـــاً** / 'ecmā'an/: [عربـی] *قیـد.* بـەگـشتی؛ هـەمـوو؛ هـەرهـەمـوو؛ بـە جـارێ؛ بـەکۆمـەڵ؛ وێکڕا؛ تێکڕا؛ پێکـەوە؛ بـەڕایـە؛ گـردەوە ‹اجماعـاً صلوات بفرستید: بە گشتی سەڵەوات بنێرن›.

**اجمـــال** / 'ecmāl/: [عربـــی]/اســـم. *[ادبـــی]* بـەکـورتی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتیـەکـی کـورت ‹مـاجرا را بـە اجمـال بیـان کـرد: ڕووداوەکـەی بەکورتی گەڕاندەوە›.

**اجمـالاً** / 'ecmālan/: [عربـی] *قیـد.* بـە کـورتی؛ کورت‌وبڕ.

**اجمـــالی** / 'ecmālî/: [عربـــی] *صـفت.* کـورت؛ خێرا؛ کورتکراو.

**اجناس** / 'acnās/: [عربی] جمعِ ☜ **جِنس**

**اجنبـی** [1] / 'acnabî، ـهـا؛ اجانـب/: [عربـی]/اسـم.

بێگانە؛ لاوەکی؛ بیانی؛ هاقی؛ کەس،گرۆ یان دەوڵەتی لاوەکی؛ دەرەوەیی؛ نامۆ ‹نوکر اجنبی: نۆکەری بێگانە›.

**اجنبی**[2]: *صفت.* بێگانە؛ بیانی؛ نەناس؛ بەیانە؛ لایدە؛ نەناسیاو ‹مرد اجنبی: پیاوی بێگانە›.

**اجنبی‌پرست** / acnabîparast'، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بێگانەپەرەس؛ بیانی‌پەرەس؛ لاوەکی‌پەرست؛ بریتی لە جیرەخۆر و نۆکەری بێگانە.

**اجنه** / acenne'/: [عربی] جمعِ ☜ **جِن**

**اجوف** / acvaf'/: [عربی] *صفت. [ادبی]* هولۆڵ؛ هەڵۆڵ؛ هەرۆڵ؛ قرۆڵ؛ ناوپووچەڵ؛ ناوچۆڵ؛ قولۆر؛ هەلکۆلیاگ؛ بۆش؛ قالا؛ کلۆر.

**اجیر** / acîr'، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* مزوور؛ بەکرێ‌گیراو؛ کرێ‌گرتە؛ کرێچاڵە ‹یک سال نزد ارباب ده اجیر بودم: ساڵێ لە لای کوێخوای ئاوایی مزوور بووم›. هەروەها: **اجیر کردن؛ اجیر شدن**

**احادیث** / ahādîs'/: [عربی] جمعِ ☜ **حدیث**

**احاطه** / ehāte'/: [عربی] *اسم.* کار یان ڕەوتی: *الف)* دەوردان؛ چوار لادان؛ هەموو لا لێ گرتن؛ دەورگرتن؛ پەرانپەری شتێک داگرتن *ب)* شارەزایی تەواو لە هەموو لای بابەتێک پەیداکردن.

▣ **احاطه داشتن:** زاڵ بوون؛ ئاگاداری بە گش لایەکدا پەیدا کردن؛ ئاگەداری هەمە لا بوون.

**احاطه کردن:** لێ وەرهاتن؛ گەمارۆ دان؛ هەموو لا لێ گرتن؛ دەورەدان؛ ئابلۆقە دان؛ هێڵ‌دان؛ هەوشەدان؛ کۆ بوونەوە لە دەوری کەسێ یان شتێک. هەروەها: **احاطه شدن**

**احاله** / ehāle'/: [عربی] *اسم.* پێ‌سپێری؛ سپاردنی کارێک بە کەسێکی‌تر. هەروەها: **اِحاله دادن؛ اِحاله کردن**

**احباب** / ahbāb'/: [عربی] *اسم.* ۱. جمعِ ☜ **حبیب** ۲. *[ادبی]* یاران؛ دۆستان؛ هاوەڵان؛ ڕەفێقان؛ هاوبازان؛ هاویاران؛ خۆشەویستان؛ هەڤالان؛ هەوالان.

**احتباس** / ehtebās'/: [عربی] *اسم. [پزشکی]* گیراوی؛ گیریاگی؛ کار و ڕەوتی گیرکردن؛ بە تەنگ‌کەوتن ‹احتباس بول: گیراوی میز›.

**احتجاج** / ehtecāc'، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* بەربەرەکانێ؛ کار و ڕەوتی دەم‌نانەدەم؛ دەم لە دەم نان؛ قسەکردن بۆ سەلماندن، نەک بۆ دەرکەوتنی ڕاستەقینە.

**احتراز** / ehterāz'، ـها/: [عربی] *اسم.* پارێز؛ دووری؛ خۆلادەری؛ خۆپارێزی. هەروەها: **احتراز کردن**

**احتراس** / ehterās'/: [عربی] *اسم. [قدیمی]* پاسەوانی؛ نیابانی؛ چاوەدێری؛ زێرەڤانی؛ کێشکڤانی؛ قەرەوڵی؛ پاسداری.

**احتراق** / ehterāq'، ـها/: [عربی] *اسم.* کار یان ڕەوتی سووتان؛ سۆتەی؛ سۆتن؛ گڕ لێ‌هەستان.

▣ **احتراق کامل:** *[شیمی]* سووتانی تەواو؛ یەکگرتنی تەواوەتی ماکی سووتەر لەگەڵ ئوکسیژندا بە مەرجی هەبوونی گەرما، ئوکسیژنی پێویست و تیکەلاوی شیاو لە کاتی شیاودا.

**احتراق ناقص:** *[شیمی]* سووتانی ناتەواو.

**احترام** / ehterām'، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* ڕێز؛ قەدر؛ کەل؛ حورمەت؛ هورمەت؛ ئاکارێک کە نیشانەی پەژیرانی بایەخ، گرینگی و پلەی بەرزتری کەسێ یان شتێکە.

▣ **احترام نظامی:** ڕێزی چەکداری.

▣ **احترام خود را نگه داشتن:** حورمەتی خۆ

ڕاگـرتن؛ ڕێـزی خـۆ ڕاگـرتن؛ خـۆ لادان لـە ئاکارێـک کـە دەبێتـە هـۆی سـووکی و بـێحورمـەتی لـە لایـەن خـەڵکەوە ‹داداش! احترام خـودت را نگهـدار: کاکـە! حورمـەتی خـۆت ڕاگرە›.

**احتـرام کـسی بـه دسـت خـودش بـودن:** وریـای ڕێـز و حورمـەتی خـۆ بـوون؛ ڕێـزی خۆ ڕاگرتن.

**احترام کسی را نگه داشتن:** ڕێـز بـۆ کـەسـێ دانـان؛ بـە گـەورەتـر خـاوەن گـەورەیی زانینی کەسێک.

**احتـرام گذاشـتن:** ڕێزگـرتن؛ ڕێـز لێنـان؛ حورمـەتگـرتن؛ سـەنـگ نیـان؛ سـەنـگ لێنان؛ سەنـگگـرتن؛ ئێحتـرامگـرتن؛ قوڵـف لێنان؛ قەدرگرتن. هـەروەهـا: **احتـرام کـردن؛ احترام به جای آوردن**

**احترامـاً** / 'ehterāman/: [عربـی] *قیـد*. بـەڕێـزەوە؛ بـە حورمـەتـەوە ‹احتراماً بـه عـرض می‌رساند: بەڕێزەوە ڕادەگەیێنرێت›.

**احتـساب** / 'ehtesāb/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* ۱. *[نامتـداول]* ژمـاردن؛ بـژاردن ۲. *[قـدیمی]* ژماریاری؛ ئەو کارانەی ئـەرکـی ژماریـار بـوو ۳. *[فقه]* فەرمان بە چاکە و لادان لە خراپە.

**احتـشام** / 'ehtešām/: [عربـی] *اسـم. [نامتـداول]* شکۆ؛ شێدوبێد؛ گەورەیی.

**احتـضار** / 'ehtezār/: [عربـی] *اسـم*. ئاویلکـە؛ گیانـەڵا؛ گیانـەلاو؛ دواگیـان؛ سـەرەمـەرگ؛ گیانکەنـشت؛ ئاوزینـگ؛ ئـاوەزینـگ؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی گیانـدان و لـە سـەرەمـەرگـدا بـوون ‹عمـویم در حـال احتـضار اسـت: مـەمـۆم کـەوتۆتـە ئاویلکە›.

**احتقـان** / 'ehteqān/: [عربـی] *اسـم. [پزشـکی]* گیران؛ پـەتـران؛ کـۆ بوونـەوەی نائاسـایی هـەر شتێک لـە لـەشدا، کـە دەبێتـە هـۆی گـیرانی دەماری لەش ‹احتقان بینی: گیرانـی لووت›.

▣ **احتقـان بینـی:** لـووت گیریـان؛ گیریـانی بێـڤل؛ کـپ بوونـەوەی کـەپـۆ. هـەروەهـا: **احتقان سینه**

**احتقان پستان:** مەمـک گیریـان؛ گـۆی سـینە گیریان.

**احتکـار** / 'ehtekār/: [عربـی] *اسـم*. کـار و ڕەوتی هـەمارکردن؛ پـاوان کـردن: ۱. کـۆ کردنەوەی شـتێ پتـر لـە ڕادەی پێویـست یـان بـەبێ کـەڵـک لـێوەرگرتنیـان ۲. *[اقتـصاد]* هـەڵـگرتنی شـت تـا نرخـی گـران بێتـەوە. هەروەها: **احتکار شدن؛ احتکار کردن**

**احتکـاری** / 'ehtekārî/: [عربـی] *صـفت*. هەمارکراو؛ پاوانکراو؛ قۆرخکراو.

**احـتلام** / 'ehtelām/: [عربـی] *اسم*. شـەیتـانی؛ شەیتان پێکەنین؛ ئاوهاتنەوە لە خەودا.

**احتمـال** / 'ehtemāl، ـهـا؛ ـات/: [عربـی] *اسم*. وێچـوویی؛ شـیمانی؛ گاهـەزی؛ ڕێـپـێچـوویی؛ گومـانی نزیـک بـە ڕاسـت کـە هێـشتا نەسەلماوە.

▣ **احتمـال قریـب بـه یقـین:** زۆر وێچـوون؛ تـا ڕادەیەکی زۆر سەلماو: **به احتمال قوی**

**بـه احتمـال قـوی** ☜ **احتمـال قریـب بـه یقین**

▣ **احتمـال دادن:** دوور نـەزانـین؛ ئـەگـەری ڕووداوێـک بـۆ ڕەخـسان/ لـوان ‹همه احتمـال مـی‌دادیـم زود برگـردد: هـەمـوو دوورمـان نەدەزانی زوو بێتەوە›.

**احتمـال داشـتن:** وێچـوون؛ دوور نـەبـوون ‹احتمال داشت هرگز او را نبینم: وێدەچوو قـەت نەیبینم›.

**احتمالاً** / 'ehtemālan/: [عربـی] *قیـد*. لـەوانـەیـە؛ وێـدەچـێ؛ شـایەت؛ گاهـەز؛ ڕەنگـە؛ بـە ئێحتماڵ؛ شـایەکـێ؛ شـایەد؛ شـایەتـا؛ دەشـێ؛ ئـەشـێ ‹احتمـالاً او را خـواهم دیـد: لـەوانـەیـە ببینم›.

**احتمالی** / ehtemālî'/: [عربی] صفت. ئەگەری؛ ئگەری؛ دووبەختی؛ گاهەزی؛ شایەدی؛ لەوانە بوون.

**احتوا** / ehtevā'/: [عربی] اسم. [نامتداول] پێبوونی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تێدا بوون؛ داگری شتێ بوون.

**احتیاج** / ehtiyāc' ، ـها؛ ـات/: [عربی] اسم. نیاز؛ ئاتاجی؛ پێداویستی؛ پێویستی؛ هەجی؛ هەوجە؛ قاپۆ؛ کەل؛ وەجە: ۱. بار و دۆخ یان حاڵەتی ویستنی شتێ بۆ گەیشتن بە مەبەستێ یان ئەنجامدانی کارێک ‹من به این پول احتیاج دارم: من پێویستیم بەم پارەیە› ۲. نیازمەندی؛ بار و دۆخی نەبوونی کەلوپەلی پێویست ‹احتیاج مادر اختراع است: پێداویستی هۆی داهێنانە›.

▣ **احتیاج افتادن:** نیازمەند بوون؛ ئەوەجە کەوتن؛ وەجە بە کەل کەوتن؛ تووشی نیازباری بوون.

**احتیاج بودن:** پێویست بوون ‹احتیاج بود یک بار دیگر آن را بخوانم: پێویست بوو جارێکی‌تر بیخوێنمەوە›.

**احتیاج داشتن:** پێویستی پێ بوون؛ پێویست بوون؛ گەرەک بوون؛ ئیحتیاج پێ بوون؛ نیازمەن بوون ‹او به آن پول احتیاج داشت: ئەو پارەیەی پێویست بوو›.

**احتیاج کسی را برآورده کردن:** کەلی کەسێ گرتن؛ دەس یەکێ گرتن؛ کەل یەکێ گرتن؛ بە دەم کەسێکەوە بوون؛ دابین کردنی ئەوەی کە کەسێک پێویستیەتی.

**احتیاط** / ehtiyāt' ، ـها/: [عربی] اسم. ۱. پارێز؛ خۆپارێزی؛ پێش‌بینی مەترسیگەل و ڕێگەگەلی خۆ لێ‌لادانیان ‹احتیاط شرط عقل است: خۆپارێزی مەرجی بە ئاوەز بوونە› ۲. [نظامی] یەدەک؛ سپێر؛ بەشێ لە هێزگەل کە فەرماندە بۆ کاتی پێداویست لە پشتی شەڕکەرانەوە ڕایاندەگرێ.

▣ **افسر احتیاط** ☜ **افسر**

▣ **احتیاط داشتن:** [اسلام] شکدار بوون؛ بەگومان بوون؛ دڕدۆنگ بوون؛ ڕوون نەبوونی پاکی یان ناپاکی، ڕەوا یان ناڕەوا بوونی شتێ.

**احتیاط کردن:** بە هۆش بوون؛ هۆشیار بوون؛ دووربین بوون؛ بە تەگبیرەوە کارکردن.

**احتیاطاً** / ehtiyātan'/: [عربی] قید. بە دوورنوارییەوە؛ بۆ دڵنیایی ‹احتیاطا کمی پول با خودت ببر: بۆ دڵنیایی بڕێ پارە لەگەڵ خۆت بەرە›.

**احتیاط‌کار** / ehtiyātkār' ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. قایم‌کار؛ هۆشیار؛ تێبین؛ دووربین؛ دوورئەندێش؛ دوورنواڕ؛ سپێرکار.

**احتیاط‌کاری** / ehtiyātkārî'/: [عربی/ فارسی] اسم. دوورئەندێشی؛ دووربینی؛ دوورنواڕی؛ قایمکاری؛ سپێرکاری.

**احتیاطی** / ehtiyātî'/: [عربی/ فارسی] صفت. دوورنواڕانە ‹اقدامهای احتیاطی: داپەڕی دوورنوارانە›.

**احجار** / ahcār'/: [عربی] جمعِ ☜ **حَجَر**

▣ **احجار کریمه:** [ادبی] بەردگەلی گرانبایی؛ بەرێت گرانبەها؛ بەردە بەنرخەکان.

**احد** / ahad'/: [عربی] صفت. [ادبی] تاک؛ تاقانە؛ تاکانە؛ تاق؛ بێ‌هاوتا؛ یەکدانە؛ یەکتا ‹خدای احد و واحد: خوای تاکی تەنیا›.

**احداث** / ehdās'/: [عربی] اسم. کار یان ڕەوتی کردنەوە؛ بە دی هێنانی شتێکی نوێ کە پتر بەرهەمی چالاکیگەلی خانووسازیە (وەک نەخۆشخانە، شەقام، پرد، ماڵ و...) ‹احداث کارخانه ها از کارهای اساسی برای پیشرفت کشور است: کردنەوەی کارخانەگەل لە کارە

بنەڕەتیەکانی پێشکەوتنی وڵاتە›.

**احدالناس** / ahadonnās'/: [عربی] ضمیر. کەس؛ هیچ کەس؛ تاقەکەسێک؛ یۆ؛ یوە؛ شتاق ‹در خیابانها احدالناسی دیده نمی‌شد: لە شەقامەکاندا کەس نەدەبینرا›.

**احدی** / ahdadî'/: [عربی] ضمیر. *[گفتاری]* کەس؛ هیچ کەس؛ یۆ؛ یوە؛ شتاق ‹از احدی نمی‌ترسید: لە کەس نەدەترسا›.

**احدیت** / ahadîyyat'/: [عربی]/اسم. ۱. *[ادبی]* یەکدانەیی؛ تاقانەیی؛ تەنیایی؛ یەکتایی ‹احدیت خداوند: تاقانەیی خودا› ۲. *[مجازی]* تاکی توانا؛ خودای یەکتا ‹دعا بە درگاه احدیت: نزا لە بارەگای تاکی توانادا›.

**احرار** / ahrār'/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* ۱. سەربەستان؛ هەشازان؛ ڕزگاران ۲. ئازادی‌خوازان؛ ڕزگاری‌خوازان.

**احراز** / ehrāz'/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* دەستگەیشتوویی؛ دەسگەییوی؛ دەستڕەسی؛ دەسکەوتوویی؛ مشتکەوتوویی.

▣ **احراز کردن**: بە دەست هێنان؛ دارا بوون؛ دەست خستن ‹در میان شرکت کنندگان مقام اول را احراز کرد: لە نێو بەشداربووەکاندا پلەی یەکەمی بە دەست هینا›.

**احرام** / ehrām'/: [عربی]/اسم. ئیحرام: ۱. خاولی و فۆتەی دوو لەتی حاجیان کە لە وەختی حەج کردندا بە خۆیانەوە دەپێچن ۲. ئاهەنگی حەج ۳. لە سەر خۆ حەرام کردنی برێ شت (لە ڕۆژانی حەجدا).

▣ **احرام بستن**: ئیحرام بەستن: ۱. بەرگی تایبەتی حەج پۆشین ۲. ئاهەنگی حەج کردن.

**احرام گرفتن**: حەج‌کردن؛ حەج بە جێ هاوردن.

**احرامی** / ehrāmî'/: [عربی]/اسم. جانماز؛ جۆرێ بەرماڵی لە خوری یان پەموو بە نەخشگەلی ڕەش یان شین لەسەر زێوارەی سپیدا.

**احزاب** / ahzāb'/: [عربی] جمعِ ☜ **حِزب**

**احساس** / ehsās'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. هەست؛ هاس؛ ئیحساس: ۱. پسۆ؛ کار یان ڕەوتی هەست پێ‌کردن ۲. هۆشە؛ ئاخێز یان بە خۆدا هاتنی دەروونی ‹تو اصلاً احساس نداری: تۆ هیچ هەستت نیە› ۳. ئاگایی و زانستی ناڕوون ‹احساس خطر: هەستی مەترسی›. هەروەها: **احساس داشتن؛ احساس شدن**

▣ **احساس خشم**: کسپوکۆ؛ هەستی قیز و ڕک؛ هەستی تووڕەیی.

**احساس سوزش**: تووزیانەوە؛ چووزانەوە؛ کزانەوە؛ کزیانەوە؛ جووزیانەوە؛ ئەوەکزیەی؛ برژانەوەی پێست و زام.

**احساس نفرت**: کسپوکۆ؛ هەستی بێزاری.

▣ **احساس کردن**: هەست پێ‌کردن؛ پێ‌زانین؛ ئاگا کردن؛ هەست‌کردن؛ هەسیان؛ حەسیان؛ سەحکرن؛ پەلیان.

**احساسات** / ehsāsāt'/: [عربی]/اسم. هەست؛ کوڵی دەروون؛ هەستی هەناو؛ جۆشی دەروونی؛ کوڵەی دڵ؛ کوڵەی ناخ؛ قوڵقوڵەی دڵ ‹احساسات بشر دوستانه: هەستی مرۆڤ دۆستانە›.

**احساساتی** / ehsāsātî'/: [عربی] صفت. حەسانی؛ هاسی: ۱. تووشی هەیجانی دەروونی ‹آن روز بچه‌ها خیلی احساساتی شده بودند: ئەو ڕۆژە منداڵەکان زۆر حەسانی ببوون› ۲. بە جۆشی دەروونی زۆرەوە ‹آزاد جوانی احساساتی است: ئازاد لاوێکی حەسانیيە›.

**احساسی** / ehsāsî'/: [عربی] صفت.

هەستۆکی؛ هەستی؛ ئیحساسی؛ پێوەندیدار یان سەر بە هەستەوە ‹ترسم یک ترس احساسی است: ترسم ترسێکی هەستۆکیە›.

**احسان** / ehsān'، ـها/: [عربی]/اسم. چاکە؛ باشە؛ پیاوەتی؛ خاسی و بەخشین لە ڕێی ڕەزامەندی خودا.

▣ **احسان کردن:** خێرکردن؛ ئیحسان کردن؛ چاکە کردن؛ خەیرگەیاندن؛ بەخشین بە پیاوەتی و بێ تەمای قەرەبوو.

**احسن** / ahsan'/: [عربی] صفت. /ادبی/ خاستر؛ باشتر؛ چاکتر؛ بێ کەمایەسی ‹کارش را به نحو احسن انجام میدهد: کارەکەی بێ کەمایەسی جێبەجێ دەکا›.

▣ **به نحو احسن** ☜ **نَحو**

**احسنت** / ahsant'، ـها/: [عربی] صوت. ئافەرەم؛ ئافەرین؛ ئافەریم؛ بارەکەڵڵا؛ دەست خۆش ‹فریاد احسنت حاضران برخاست: دەنگی ئافەرینی دانیشتوان بەرزەوە بوو›.

**احشا** / ahšā'/: [عربی]/اسم. چەشگە؛ هەناو؛ هەناڤ؛ جەرگ و دڵ؛ جیق؛ حورگش؛ ناوزگ؛ ورگ و ناو؛ جەرگ و ناو؛ هێلاک؛ گەیگ؛ گەیێ؛ پزۆر؛ هەندرخان؛ ناڤ؛ ناڤزگ؛ دەروون؛ هەرچی لە ناو زگایە؛ ناو؛ گەوو؛ زیق؛ ناخ؛ ناوسک؛ ئەندامگەلی ناو سک (وەک جەرگ، گورچیلە، سپڵ و…).

**احشام** / ahšām'/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **حَشَم** ۲. زینەماڵ؛ زیندەماڵ؛ ماڵ؛ ئاژەڵ؛ کەواڵ؛ مالات؛ مالیات؛ پاتاڵ؛ ولسات؛ ماڵ و پەز؛ گا و گوێر؛ گاوڕان؛ ڕان؛ گاڕان؛ ڕەویە؛ وردەپا؛ گا و گۆل و مەڕ و مالات.

**احصا** / ehsā'/: [عربی]/اسم. /قدیمی/ ئەژماری؛ هژماری؛ هەژماری؛ شمێری؛ بژاری.

▣ **احصا کردن:** ژماردن؛ ژمێرین؛ ژمارین؛ شماردن؛ شمێرین؛ بژاردن؛ ئژمارەی.

**احصائیه** / ehsā'îyye'، ـها/: [عربی]/اسم. /قدیمی/ هەڵژماری؛ ژمێرکۆ.

**احضار** / ehzār'/: [عربی]/اسم. /ادبی/ بانگ؛ کار یان ڕەوتی خواستن؛ بۆ لای خۆ بانگ کردن.

▣ **احضار ارواح:** ڕۆح هێنانەوە؛ بانگ کردنی ڕۆح؛ بانگ کردنی ڕۆحی مردوان لە لایەن کەسانێکەوە خۆ لەم بابەتە دەدەن.

▣ **احضار شدن:** بانگ کران؛ بانگێشتن کران؛ قاوکران.

**احضار کردن:** بانگ کردن؛ قاوکردن؛ بانگێشتن کردن.

**احضارنامه** / ehzārname'، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. /حقوق/ بانگێشتن‌نامە؛ نووسراوەیەک کە بە پێی ئەوە بەرپرسی دادپرسی ئەمر بە بانگێشتنی تاوانکار، گەواهیان ئاگادار، بۆ دادگا دەکا: **احضاریه؛ خواستبرگ**

**احضاریه** / ehzārîyye'/: [عربی] ☜ **احضارنامه**

**احفاد** / ahfād'/: [عربی]/اسم. /ادبی/ نەوە و وەچە؛ زازان؛ نەڤان؛ زاوڵەزەی؛ نەوەونەوەزا؛ نەڤیونەڤیچڕ.

**احق** / ahaq(q)'/: [عربی] صفت. /ادبی/ هێژاتر؛ شیاوتر؛ لەبارتر؛ لێوەشاوەتر؛ شانتر؛ لایەق‌تر.

**احقاق** / ehqāq'/: [عربی]/اسم. کار و ڕەوتی وەرگرتنی ماف؛ گەیاندنە جێ؛ حەق گرتن.

▣ **احقاق حق:** ماف سەندن؛ حەق گرتن؛ خاوەن ماف بە مافی خۆ گەیاندن.

**احقر** / ahqar'/: [عربی] صفت. /ادبی/ بچووکتر؛ نزمتر؛ سووکتر.

**احکام** / ahkām'/: [عربی] جمعِ ☜ **حُکم**

▣ **احکام شرعی:** بڕیارە ئایینیەکان؛ بڕیارگەلی دینی.

**احکام عشره**: دەفەرمان؛ فەرمانگەلی دەیانە؛ فەرمانگەلێک کە بە بڕوای جوولەکە، خودا بە حەزرەتی مووسای داوە: **دەفرمان**

**احلاف** / 'ahlāf/: [عربی]/*اسم. [حقوق]* سوێندکاری؛ کار یا ڕەوتی سوێندان.

**احلام** / 'ahlām/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* خەونە خۆشە؛ خەوانی خۆش.

**احلیل** / 'ehlîl/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* ۱. مۆزی؛ مۆزیک؛ کونی کێر ۲. *[مجازی]* کێر.

**احمر** / 'ahmar/: [عربی] *صفت. [نامتداول]* سوور؛ به ڕەنگی سوور.

**احمق**[1] / 'ahmaq، ـها؛ ـان؛ حُمَقا/: [عربی] /*اسم.* نەزان؛ کەر؛ نەفام؛ گەوارەنە؛ تێ‌نەگەیشتوو؛ بێ‌ئاوەز؛ کەسێ کە مێشکی لە هۆش یان توانایی بۆش بێ ‹بوَد تا احمق اندر دهر، مفلس درنمی‌ماند: تا نەزان لە جیهان هەبێ، بێکارە قەت دانامێنێ›.

**احمق**[2]: *صفت.* گەوج؛ گەوارەنە؛ حۆلحۆلە؛ بێ‌عەقڵ؛ کەرمەغز؛ گوێلەق؛ زڕەک؛ گەمژە؛ گەلحۆ؛ گێل؛ دەبەنگ؛ بێ‌مەژگ؛ ڕێژگاڵ؛ خەشۆ؛ خەشیم؛ کەلەپووک؛ مێشکوشک؛ کەلهوو؛ ناحاڵی؛ حەپش؛ بلح؛ نەفام ‹آدم احمق خودش را عقل کل می‌داند: مرۆی گەوج خۆی بە زۆر زانا دەزانێ›.

⊡ **احمق شدن**: گەوج بوون؛ گواڕیاین؛ خۆکەرکردن؛ بە ڕاشکاوی خۆ لە نەفامی دان.

**احمقانه**[1] / 'ahmaqāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* نەزانانە؛ گەوجانە؛ بێ‌عەقلانە؛ سایلۆحانە ‹سخن احمقانه: قسەی گەوجانە›.

**احمقانه**[2]: *قید.* گەوجانە؛ نەزانانە؛ لە ڕووی نەزانییەوە ‹احمقانه می‌خندید: گەوجانە پێدەکەنی›.

**احمقی** / 'ahmaqî، ـها/: [عربی]/*اسم.* گەوجی؛ بێ‌ئاوەزی؛ نەفامی؛ سایلۆحی؛ گێلی؛ دەبەنگی؛ گەمژەیی.

**احوال** / 'ahvāl/: [عربی]/*اسم.* ژیوار؛ چۆنیەتی؛ بار؛ حار؛ حاڵ؛ ئەحوال: ۱. حاڵ و باڵ؛ چۆنیەتی دۆخی کەسێک یان جێگایەک ‹چیزهای عجیبی از احوال آنجا و مردمش تعریف می کرد: شتی سەیری لە ژیواری ئەوێ و خەڵکەکەی ئەگێڕایەوە› ۲. /ـها/ حاڵ؛ ئەحواڵ؛ چۆنیەتی دۆخی دەماخی (ساقی یان نە خۆشی) ‹احوال شما چطور است؟: حاڵتان چۆنە؟› ۳. سەرگوروشتە؛ ژیننامە؛ بەسەرهات؛ شەرحی حاڵ ‹کتابی در احوال گاندی نوشته است: کتێبێکی لە مەڕ ژیننامەی گاندییەوە نووسیوە› ٤. *[حقوق]* کۆمەڵە زانیاریگەلی تایبەت بە کەسێ لە باری قانوونی شارستانیەتەوە (وەک ناو، جێ‌ژیان، ژمارەی پێناسە و...).

⊡ **احوال کسی را پرسیدن**: هەواڵی کەسێ لێ‌پرسین؛ چاک‌وچۆنی لە کەسێ‌کردن؛ وشی‌وتشی چنی یۆی‌کەردەی.

**احوال کسی را نپرسیدن**: *[مجازی]* ئاوڕ لەکەسێ نەدانەوە؛ گوێ بە کەسێ نەدان؛ لا لە کەسێ نەکردنەوە.

**احوال گرفتن**: هەواڵ گرتن؛ هەواڵ پرسین؛ لە دۆخ یان ژیواری کەسێک پرس و جۆ کردن.

**احوالپرسی** / 'ahvālporsî، ـها/: [عربی] /*اسم.* هەواڵپرسی؛ چاک‌و خۆشی؛ چاک‌و چۆنی؛ خۆشی ویشی؛ خۆش و چۆنی؛ خۆشی و بۆشی؛ خوەش‌ودشی؛ خوەرپرسی؛ وەش‌وتشی: ۱. لە بار و ژیواری کەسێ پرسینەوە ‹خالەام مریض است، دیروز رفتم احوالپرسی او: پوورم نەخۆشە، دوێنێ چوومە هەواڵپرسییەوە› ۲. پرسیار لە حاڵ و باڵی کەسێک و خزمانی (وەک ئەمە بێژن:

چۆنی؟ چاکی؟ باشی؟ وەشەنی؟ چ دەکەی؟ لە چی‌دای؟ بنەماڵەت چۆنە؟ منالەکان چۆنن؟ و...). هەروەها: **احوالپرسی کردن**

⊡ **احوالپرسی کسی رفتن:** سەردان؛ دیتن؛ خەوەر پرسین؛ بۆ هەواڵی کەسێک رۆیشتن؛ بۆ دیتن/ سەردانی نەخۆشێک چوون.

**احول** / 'ahval/: [عربی] صفت. *[ادبی، نامتداول]* هەڵجەڕ؛ خێل؛ چاوخوار؛ خوێل؛ چاولار؛ چاوگێڕ؛ خوارو خێچ؛ چەملار؛ خوول؛ خوویل؛ چاو چەوێل؛ کەسێ کە گلێنەی چاوی لە جێی خۆی نەبێ.

**احیا** / 'ahyā، ـها/: [عربی]/اسم. شەونوخسی؛ شەونخوونی؛ شەوبەیاری؛ شەوزیندوویی؛ شەوخەوەری؛ شەو وریایی.

⊡ **احیا گرفتن:** شەو بەیاگرتن؛ (شەو بە) ڕۆژ کردنەوە؛ ئەنجام دانی دابی شەوانی تاقی نیوەی دووهەمی مانگی ڕەمەزان.

**احیا** / 'ehyā/: [عربی]/اسم. کار و ڕەوتی ژیاندنەوە؛ زیندووکردنەوە؛ ئیحیا؛ بووژاندنەوە؛ وەگوڕخستنەوە؛ زینەو کردنەوە؛ زینگەوکردن؛ گەشەوکردنەوە؛ گەشە پێدانەوە: ١. کار یان ڕەوتی هێزدان بە بار و دۆخی کەسێ یان جێیەک کە تووشی شکست هاتووە ‹پدر زنم مارا احیا کرد: خەزوورەم ئێمەی ژیاندەوە› ٢. ئاوەدان کردنەوە ‹احیای مراتع: بووژاندنەوەی لێرەوارگەل›.

**احیاگر** / 'ehyāgar، ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. بووژێنەر؛ زیندوو/ زینگ/ زینی کەرەوە؛ کەسێک کە دەبێتە هۆی گەشەکردن و بووژاندنەوەی کەسێ یان شتێک.

**احیاناً** / 'ahyānan/: [عربی] قید. ١. هاتوو؛ بە هەڵکەوت؛ ڕێکەوت؛ ئەگەر؛ ئەگەرکوو؛ ئەگەرکەتەی؛ ئاماو ‹تو برو، احیاناً اگر مشکلی پیش آمد، خبرم کن: بڕۆ، ئەگەر هاتوو گرفتێک هاتە پێش، ئاگادارم کە› ٢. ڕەنگە؛ ڕەنگا؛ گاهەز؛ گاز؛ گاڤانێ؛ جاروبار؛ چەل‌چەلە؛ چلۆنهـا؛ بەدەگمەن؛ جاروبارە؛ جارجار؛ هنگاڤی؛ جارێک لە جاران ‹کس و کاری را دارد کە احیاناً بتوانند قدری دلسوز او باشند: چەند کەس و کاری هەن کە ڕەنگە بتوانن بۆی باش بن›.

**اخ** / 'ax/: صفت. *[کودکانە]* قخ؛ قخە؛ پیس؛ ئیش؛ خراپ؛ وشەیەکە بە منداڵی دەڵێن، واتا: پیس، خراو، نەگونجاو.

**اخ** / 'ex/: صوت. تف؛ ئخ؛ ئێخ؛ قخ؛ قرخ: دەنگی تف‌کردنەوە؛ تفانەوەی شتێ لە زارەوە.

⊡ **اخ کردن:** تفینەوە؛ تفانەوە: ١. تف کردنەوە؛ لە گەروو هاوردنەوە؛ لە گەروو دەرکێشان ٢. گوڕکفن‌کردن؛ بە نابە دڵی شتێ بە تایبەت پارە بە کەسێ دان ‹باید هزار تومان اخ کنی: دەبێ هەزار تمەن بکەیە گوڕکفنی›.

**اخ** / 'ox/: صوت. ١. ئۆخ؛ ئاخ؛ ئای؛ ئۆی؛ وەی؛ دەنگێکە بە نیشانەی ئێش و ژان یان خۆ بە نیشانەی خۆشییەوە دەگوترێ ٢. ☜ **آخ**

**اخاذ** / 'axxāz/: [عربی] صفت. خوازەڵۆک؛ تەڵەکەباز؛ لێ دەرهێنەر؛ بە خوو و خدەی تەڵەکەبازی.

**اخاذی** / 'axxāzî، ـها/: [عربی]/اسم. کار و ڕەوتی لێ‌دەرکێشان؛ تەڵەکە؛ وەرگرتنی شتێ لە کەسێ بە نارەوایی (زۆرتر وەک بەرتیل، باج یان بۆ دەمبەسانە).

**اخبار** / 'axbār/: [عربی] جمعِ ☜ **خَبَر**

**اخت** / 'oxt/: [عربی] صفت. *[گفتاری]* هاودەم؛ هاونشین؛ هاودەنگ؛ وێک کەوتوو؛ هۆگرین.

▣ **اخت شدن**: وێک کەوتن؛ خووگرتن؛ هاودەم بوون. هەروەها: **اخت بودن**

**اختاپوس** / 'oxtāpûs/، ـها؛ ـان/: [از انگلیسی/ از یونانی]/اسم. حلە؛ هەشت پا؛ هەشپا؛ گیانلەبەرێکی ئاوی هەشتپایە.

**اختتام** / 'extetām/: [عربی]/اسم. [ادبی] کۆتایی؛ دوایی؛ دمایی ‹کار شمارش آرا امروز اختتام یافت: کاری ژماردنی دەنگەکان ئەمڕۆ دوایی هات›.

**اختتامیە** / 'extetāmîyye/، ـها/: [عربی] صفت. دوایین؛ دمایین؛ ڕێورەسمی دوایی هاتنی شتێ ‹مراسم اختتامیە: ڕێ و ڕەسمی دوایین›.

**اختر** / 'axtar/: اسم. ۱. / ـها؛ ـان/ ئەستێرە؛ ستێر؛ هەسارە؛ ئاسارە ۲. /ـها؛ ـان/ تەن؛ هەرچی لە ئاسمانەوە بێ و تیشک بداتەوە ۳. [ادبی] هات؛ چارە نووس؛ بەخت؛ ناوچاو؛ فریشتە ٤. /ـها؛ ـان/ لووشە گوڵ؛ گوڵە درووش؛ دووگە گورگ؛ گوڵێکی باڵا بەرزی ڕەنگ ئاڵە بە گەڵای زۆر پانەوە.

**اختراع** / 'exterā'/، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. کار و ڕەوتی داهاوردن؛ داهانین؛ داهێنان؛ وەدی هێنانی شتێ نوێ؛ لە نوێ هێنان؛ وەش کەردەی؛ چێ کردنی شتێکی تازە، بە هێزی خەیاڵ و ئەزموون (بێئەوەی پێشتر وێنەی بووبێت) ‹ادیسون اختراعهای زیادی داشت: ئێدیسۆن داهێنانی زۆری هەبوو›.

▣ **اختراع جدید**: نووژەن؛ نەڤازە؛ تازە داهاتگ؛ تازە هاتوو؛ تازە هاتی.

**اختراعی** / 'exterā'î/: [عربی] صفت. ۱. داهێنراو؛ نەڤازە؛ وەش کریا ۲. [مجازی] هەڵبەستراو؛ نارەسەن.

**اختربینی** / 'axtarbînî/ ☜ **اَختَرشُماری**

**اخترسرا** / 'axtarsarā/، ـها/: اسم. ئاسماندۆز.

**اخترسنجی** / 'axtarsancî/، ـها/: اسم. ئەستێرەپێوی؛ سەرنجدانی دۆخ و جمینی تەنە ئاسمانیەکان لە باری زانستیەوە.

**اخترشماری** / 'axtaršomārî/: اسم. خێڤزانکی؛ خێفزانی؛ ئەستێرەگەری؛ بەختناسی؛ کەسێ کە لە ئەستێرە دەڕوانێ و هات و نەهاتی تێدا دەبینێ: **اختربینی**؛ **اخترگویی**

**اخترشناسی** / 'axtaršenāsî/: اسم. ئەستێرەناسی؛ هەسارەناسی؛ ئەستێرەوانی؛ هەسارەوانی؛ زانستی دۆزینەوە و تێڕوانینی تەنە ئاسمانیەکان. هەروەها: **اخترشناس**

**اخترگویی** / 'axtargûyî/ ☜ **اَختَرشُماری**

**اخترنگاری** / 'axtarnegārî/: اسم. ئەستێرەکێشی؛ هەسارەکێشی؛ لقێ لە زانستی ئەستێرەناسی کە تایبەتە بە نەخشە کێشانی گەردوونی و ناساندنی ئاسمان.

**اخترنما** / 'axtarnemā/، ـها؛ ـیان/: اسم. کوازار؛ هەرکام لەو تەنە ئاسمانیە ئەستێرەئاسایانە کە لە مەودای یەکجار دوور لە زەوینەوەن: **کوازار**

**اختروش** / 'axtarvaš/ ☜ **سَیّارک**

**اختصار** / 'extesār/، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. کورتی؛ پوختەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کورت بوون ‹رعایت اختصار در بیان مطالب ضروری است: ڕەچاو کردنی کورتی لە وتنەوەی وتەگەلدا پێویستە›.

▣ **اختصار کلام**: پوختەی وتە؛ کورتەی مەبەست.

▣ **اختصار کردن**: درێژە پێنەدان؛ کورت کردنەوەی بابەت.

**اختصاراً** / 'extesāran/: [عربی] قید. بە کورتی ‹شرح مذاکرات را اختصاراً بنویسید: چۆناوچۆنی وتوویژەکان بە کورتی بنووسن›.

**اختصارات** / 'extesārāt/: [عربی]/اسم. کورتکراوان؛ پیت یان وتەگەلێک کە

کورتکراوەی وشە یان ڕستەیەکن (وەک: ژ.ک، بە جێی ژیانەوەی کورد).

**اختصاری** / extesārî' ، ـها/: [عربی] صفت. کورتکراو؛ کۆتاوەبووگ ‹نشانەهای اختصاری: نیشانەگەلی کورتکراو›.

**اختصاص** / extesās' ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. تایبەتدەری؛ تەرخان کری؛ تەرخانکاری.

◘ **اختصاص دادن**: تەرخان کردن؛ تایبەت دان؛ بۆ کەسێ یان شتێک دانان ‹اتاقی را بە کامپیوتر اختصاص دادند: ژوورێکیان بۆ کامپیۆتەر تەرخان کرد›.

**اختصاص‌داشتن**: تایبەت بوون؛ تایبەت بە کە سێ یان شتێ بوون ‹این اتاق بە کامپیوتر اختصاص دارد: ئەم دیوە تایبەت بەکامپیۆتەرە›.

**اختصاصاً** / extesāsan'/: [عربی] قید. بەتایبەت؛ بە تایبەتی؛ تەیبە؛ بە شێوەی تایبەتی ‹این کیک را اختصاصاً برای شما پختەایم: ئەم کەیکەمان بەتایبەت بۆ ئێوە دروست کردووە›.

**اختصاصات** / extesāsāt'/: [عربی]/اسم. تایبەتمەندیگەل؛ بە شێوەیێکی تایبەتی.

**اختصاصی** / extesāsî'/: [عربی] صفت. تایبەتی؛ تایبەت؛ تەیبە؛ تاویەتی؛ خۆماڵی ‹اتاق اختصاصی: هۆدەی تایبەتی›.

**اختفا** / extefā'/: [عربی]/اسم. [ادبی] نهێنی؛ دزەکی؛ پەنامەکی ‹دکتر آرام مدتی است در اختفا بە سر می‌برد: دوکتور ئارام ماوەیەکە پەنامەکی دەژی›.

◘ **در اختفا زندگی کردن**: بە دزیەوە/ بێدزیەوە ژیان؛ بە نهێنی ژین تێپەڕ کردن.

**اختگی** / axtegî'/: [ترکی/ فارسی]/اسم. خەساوی؛ خەسیاگی؛ لە پیاوەتی کەوتوویی.

**اختلاج** / extelāc' ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. لەرە؛ لەرزە؛ شەکە ٢. [پزشکی] ڕەوتی پلدان؛ گرفت؛ پێچ‌خواردن؛ پەڕینی ئەندام؛ گرفت یان پێچ‌خواردنی کوتوپڕی و خۆنەویستی یەک یا چەند ماسوولکەی لەش، هاوڕێ لەگەڵ ئێش و ئازاردا: **اختلاج اعضا** ٣. فڕین؛ پلدان؛ بزاڤی خۆنەویستی ئەندام (وەک فڕینی پێڵوو یا برۆ).

◘ **اختلاج اعضا** ☜ **اختلاج ـ٢**

**اختلاس** / extelās' ، ـها/: [عربی]/اسم. دزی و گزی؛ دزی، بەتایبەت لە ڕێگای کەلەک و فێڵەوە (وەک دزی مووچەخۆرێک لە سەرمایەی ئەو ڕێکخراوەیەکە تێیدا کار دەکا).

**اختلاط** / extelāt'/: [عربی]/اسم. ١. تێکەڵاوی؛ تێکەڵی ‹دورگەها نتیجەی اختلاط دو نژاد یا دو گونەاند: دووڕەگەگەل ئاکامی تێکەڵاوی دوو نەژاد یان دوو تیرەن› ٢. /ـها/ [گفتاری] دەمەتەقە؛ دەمەتەقێ؛ وتوویژی دۆستانە ‹مدتی نشستیم و اختلاط کردیم: ماوەیەک دانیشتین و دەمەتەقەمان کرد›.

◘ **اختلاط کردن**: دۆسانە قسەوباس‌کردن.

**اختلاف** / extelāf' ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. جیاوازی ‹این دو پارچە باهم اختلاف دارند: ئەم دوو قوماشە جیاوازییان هەیە› ٢. جیاوازی؛ جیایی؛ جوودایی؛ یەک نەبوویی؛ جۆراوجۆری؛ چەشناوچەشنی؛ چەن لەونی ‹اختلاف زبان داریم: جیاوازی زمانمان هەیە› ٣. ناکۆکی؛ دووبەرەکی؛ ناتەبایی؛ زویری؛ نەسازیاری ‹بین آن زن و شوهر اختلاف افتادە است: ناکوکی کەوتووەتە نێوان ئەو ژن و شووەوە›.

◘ **اختلاف سطح**: بەرز و نزمی؛ جیاوازی لە بڵیندی و خواری دوو شت بەرامبەر بە یەکترییەوە.

**اختلاف سلیقە**: جیاوازی یان جۆراوجۆری سەلیقە.

**اختلاف منظر:** گۆڕانی دۆخی ڕواڵەتی شتێک بە گوێرەی گۆڕیانی جێگای چاولێکەرەوە.

**اختلاف داخلی:** دووبەرەکی؛ چەند دەستەیی؛ دومڕەکی؛ کێشە و هەرا لە ناو یەک هۆز و گەلدا.

▣ **اختلاف افتادن:** ئاژاوە داکەوتن؛ دووبە رە کی خۆش بوون؛ کێشە ساز بوون؛ جیاوازی سەرهەڵدان؛ جیاوازی ڕمیان؛ نە یاری تێکەوتن ‹میان زن و شوهر اختلاف افتاد: ئاژاوە کەوتە نێوان ژن و شووەکەوە›. هەروەها: **اختلاف انداختن؛ اختلاف پیداکردن**

**اختلاف داشتن:** ١. جیاواز بوون ٢. ناکۆک بوون.

**اختلال** / extelāl' ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. شێواوی؛ ئاڵۆزی؛ هەڵشێواوی؛ ناسامانی؛ پەرێشانی؛ تێکەڵ‌ـپێکەڵی؛ پەشۆکەیی ‹اختلال امور: شێواوی کار و بار›.

◙ **اختلال رادیویی:** پارازیت؛ خشەـخشێک کە بە ئەنقەست دەخرێتە سەر ئیزگەیەکی ڕادیۆییەوە.

**اختلال روانی:** پەرێشانی ڕەوان.

**اختلال مشاعر:** ئاوەز ئاڵۆزی؛ تێکچوونی ئاوەز.

**اختناق** / extenāq' ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. خنکاوی؛ تاساوی؛ گرفت و گیری ڕێگای هەناسە ٢. /سیاسی/ خەفەمان؛ خەفەخان؛ دەمبەست؛ دەمکوت ‹هدف از تشکیل ساواک ایجاد اختناق در جامعه بود: ئامانجی پێکهاتنی ساواک داسەپاندنی خەفەمان لە کۆمەڵگادا بوو›.

**اختە** / axte' ، ـها؛ ـگان/: [ترکی] صفت. ١. خەساو؛ خەسیو؛ خەسیاو؛ خەسیاگ؛ خەساندی؛ خاجە؛ ئەختە؛ یەختە؛ ئێختە؛ گونبڕاو؛ گون دەرهاتوو ٢. بێهێزی جنسی ٣. /مجازی/ بێوەرە؛ ترسەنۆک؛ ترسەزاڵ؛ گەوش؛ کەلەزات.

▣ **اختە کردن:** ١. خەساندن؛ کرتان کرن؛ گونەکرن؛ گون دەرهێنان؛ ئەختەکردن؛ خادمکردن ٢. /کنایی/ لەغاوکردن؛ بێدەست‌کردن.

**اختیار** / extiyār' ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. دەرەتان؛ بوار؛ ئازادی؛ سەربەستی لە کاردا ‹بە شما اختیار دادە می‌شود تا یکی از دو راه را انتخاب کنید: دەرەتانتان پێدەدرێت تا یەکێ لەم دوو ڕێگایە هەڵبژێرن› ٢. هەڵبژێری؛ هۆرچنیەی ‹هریک را خواستید می‌توانید اختیار کنید: هەرکامتێکان گەرەک بوو دەتوانن هەڵبژێرن› ٣. /فلسفە/ باری خواستی مرۆ بۆ کردن یان نەکردنی کارێک. بەرانبەر: **ناچاری**

▣ **اختیار تام داشتن:** بکوژ و ببڕ بوون؛ ئازاد بوون لە کردنی هەرکارێکدا ‹در کارش اختیار تام دارد: لە کاریدا بکوژ و ببڕ خۆیە›.

**اختیار چیزی را داشتن:** بە دەسەڵات بوون لە شتێکدا؛ لە بەرانبەری شتێکەوە خاوەنی مافی ئەنجامدانی هەر کارێک بوون.

**اختیار دارید:** ١. ئازادن؛ ئازادی ٢. /مجازی/ نابێت؛ ناوێت؛ شتی وا چۆن دەبێ؛ ناشێت؛ ناکرێ؛ مەبۆ؛ هەر باسیشی مەکە ‹اختیار دارید! مگر می‌گذارم بروید: شتی وا چۆن دەبێ! هەر نایەڵم بڕۆن›.

**اختیار کردن:** هەڵبژاردن؛ هەڵوەژارتن؛ چنین؛ هەڵچنین؛ تەڵچنین ‹او راه دیگری را اختیار کرد: ئەو ڕێگایەکی‌تری هەڵبژارد›.

**اختیاردار** / extiyārdār' /: [عربی/ فارسی] صفت. /گفتاری/ دەسەڵاتدار؛ خاوەن دەستەڵات ‹یعنی می‌گویی اختیاردار مال خودم هم نباشم؟: یانێ ئێژی دەسەڵاتداری ماڵی

خۆشم نەبم؟›.

**اختیاری**[1] / extiyārî'/: [عربی] *صفت*. بە مەیلی؛ بە کەیفیخۆ. بەرانبەر: **اجباری**

**اختیاری**[2]: *قید*. بەدەستەخۆ؛ لە ڕووی ویستنەوە ‹خندەام اختیاری نبود: پێکەنینەکەم بە دەستەخو نەبوو›.

**اخذ** / axz'/: [عربی]/*اسم*. کار یان ڕەوتی وەرگرتن؛ گرتن؛ گێرتەی.

**اخذ آرا:** کۆکردنەوەی دەنگ.

**اخذ تصمیم:** بڕیاردان.

**اخذ تماس:** پێوەندیگرتن.

**اخذ شدن:** گیران؛ وەرگیران.

**اخذ کردن:** کار و ڕەوتی وەرگرتن؛ گرتن؛ سەندن؛ گلدانەوە؛ هۆرگێرتەی؛ چنەسانەی ‹از ما صد تومان بابت اجاره اخذ کرد: سەد تمەنی بۆ کرێ لێمان وەرگرت›.

**اخذوقبض** / axz-o-qabz'، ـها/: [عربی] *اسم*. *[نامتداول]* گیروگرفت.

**اخرا** / oxrā'/: [معرب از یونانی]/*اسم*. ئۆخرا؛ خاکێک بۆ پێکهێنانی ڕەنگی جۆراوجۆر و بە ڕەنگی زەردی ئاماڵ سوور: **گِل اُخرا**

**اخرائی** / oxrā'î'/: [معرب] ☜ **اخرایی**

**اخراج** / exrāc'، ـها/: [عربی]/*اسم*. کار یان ڕەوتی دەرکردن؛ وەدەرنان؛ بەرپرنەی؛ بەرکەردەی.

**اخراج شدن:** دەرکران؛ بەرکریەی.

**اخراج کردن:** دەرکردن؛ تاراندن؛ بەرکەردەی؛ ڕەواندن؛ ڕەڤاندن؛ دەرپەڕاندن.

**اخراجی** / exrācî'، ـها/: [عربی] *صفت*. دەرکراو؛ دەرکریاگ؛ بەرکریا.

**اخرایی** / oxrāyî'/: [معرب]/*اسم*. ئوخرایی؛ بە ڕەنگی خاکی ئوخرا؛ زەردی ئاماڵ سوور.

**اخروی** / oxravî'/: [عربی] *صفت*. ئەو دنیایی؛ سەبارەت بە ڕۆژی پەسڵان.

**اخری** / oxrā'/: [عربی] ☜ **آخرَت**

**اخش** / oxeš'/: *صوت*. ئۆخەی؛ ئۆخەوەی؛ وەی؛ ئایش؛ وەیش؛ ئۆخەیچ ‹اخش دلم خنک شد: ئوخەی دلم فێنکەوە بوو›.

**اخص** / axas(s)'/: [عربی] *صفت*. تایبەت: ۱. خوازە؛ وازە ‹بە طور اخص: بە وێنەی تایبەت› ۲. هەڵچنراو؛ بژاردە ‹بە معنی اخص: بە واتای تایبەت›.

**اخطار** / extār'، ـها/: [عربی]/*اسم*. ڕاگەیاندن: ۱. بە گوێ دانەوە؛ وەبیر هێنانی سەبارەتێکی پێویست یان خۆ پاراستن لە ئەنجامدانی کارێک ‹بە شما اخطار می‌کنم کە در صورت ادامەی غیبت اخراج خواهید شد: پێتان ڕادەگەیینم ئەگەر هەروەها نەیێنەوە دەر دەکرێن› ۲. ئاگەداری مەترسی ‹اخطار حملەی هوایی: ڕاگەیاندنی هێرشی هەوایی›. هەروەها: **اخطار دادن؛ اخطار شدن؛ اخطار کردن**

**اخطارنامە** / extārname'، ـها/: [عربی/فارسی]/*اسم*. نامەیەکی قانوونی کە لە لایەن بەرپرسێکی دادوەری یان کارگێڕییەوە بۆ وەبیر هێنانەوە یان ئاگەدارکردنەوە دەردەکرێ: **اخطاریە**

**اخطاریە** / extārîyye'/: [عربی] ☜ **اخطارنامە**

**اخفا** / exfā'/: [عربی]/*اسم*. *[ادبی]* حەشاردەری؛ کار یان ڕەوتی شاردنەوە؛ سەختکەردەی.

**اخفای اشیا:** شاردنەوەی شتومەک.

**اخفای مجرم:** شاردنەوەی تاوانبار.

**اخگر** / axgar'، ـها؛ ـان/: *اسم*. *[ادبی]* بژ؛ پشکۆ: ۱. پەنگر؛ پەنگڵ؛ پەنگ؛ پن؛ پەن؛ پنگر؛ پەنگرێ؛ پۆل؛ پۆلی؛ پۆلوو؛ پلۆخ؛ پەل؛ سکڵ؛ ئەسکڵ؛ سکەڵ؛ کۆر؛ کۆزر؛ کۆزەرە؛ کلوا؛ ئیژگڵ؛ گوڵ؛ ڕەژی گەش ‹آتش نشاندن و اخگر گذاشتن: ئاگر تەمراندن و

پشکۆ تەقژاندن› ۲. پەرەنگ؛ ئاورنگ؛ ئاورینگ؛ پریشک؛ پریشکە؛ پریز؛ پریزگ؛ پلیز؛ پلیس؛ پلیزگرد؛ پرزە؛ پروسک؛ پزووسکە؛ پزووسک؛ پزیسک؛ پزیسکەی سکلی گەش؛ پزووسکەی ئاگر ‹اخگر سوزان: پەرەنگی بەگڕ› ۳. [مجازی] ئاگر؛ ئاور؛ ئایر.

◘ **اخگر درشت:** کۆتە سکەڵ؛ کەڵە پشکۆ؛ سکلی‌درشت؛ پەنگری زل.

**اخگر مشعل:** ڕەژی گەش؛ سکلی بێ‌ڕەشایی.

**اخگرکش** / 'axgarkeš/: اسم. پەنگرکێش؛ مەسێ؛ بێلۆکەی ئاسنی سەرچەماوە کە سکلی پێ لە کوانوو یان مەنگەڵ دەردێنن.

**اخگل** / 'axgal/: اسم. قەلاس؛ قەڵداس؛ داسوو؛ داسگ؛ داسووک؛ داسووکە؛ داسوولکە؛ داسە؛ سۆ؛ قلچک؛ پرزە گوڵی گەنم و جۆ.

**اخلاص** / 'exlās/: اسم. پاکی؛ دڵپاکی؛ بێ‌خەوشی ‹سخنانش از روی اخلاص بود: قسەکانی لە ڕووی پاکیەوە بوو›.

**اخلاط** / 'axlāt/: [عربی] جمعِ ☜ **خِلط**

**اخلاف** / 'axlāf/: [عربی] اسم. ۱. جمعِ ☜ **خَلَف** ۲. تۆرەمە؛ تخمان؛ ڕەچەڵەک؛ ڕەتەوە؛ کەسانێ کە لە وەچەی کەس، تیرە یان هۆزێکی سەردەمانی ڕابردوو ماونەتەوە ‹شاه اسماعیل از اخلاف شیخ‌صفی‌الدین اردبیلی بود: شا ئیسماعیل لە تۆرەمەی شێخ سەفیەدینی هەردەویلی بوو› ۳. جێ‌نشینان؛ جێگران؛ یاگەداری ‹اخلاف صفویان در تاراج و کشتار از آنان دست کمی نداشتند: جێ‌نشینانی سەفەویش لە تالان و مالاندا کەمتر لەوان نەبوون›.

**اخلاق** / 'axlāq/: [عربی] اسم. ۱. جمعِ ☜ **خُلق** ۲. خۆ؛ خوو؛ خدە؛ چۆناوچۆنی ئاکار و هەڵس و کەوتی مرۆڤ لە نێو کۆمەڵدا.

◘ **اخلاق اجتماعی:** هۆرتەوبەرە؛ نەریت؛ گەلەمپەری؛ شێوازگەلی ئاکاری باو لە کۆمەڵگادا: **اخلاق عمومی**

**اخلاق حسنه:** ئاکاری چاک؛ ڕەوشتی باش.

**اخلاق حمیده:** ئاکاری پەسندکراو؛ ئاکاری پەسندانە؛ ڕەوشتی پەسەند.

**اخلاق عمومی** ☜ **اخلاق اجتماعی**

**اخلاق مخنثان:** هیزەکی؛ کاری حیزانە؛ حیزکاری؛ حیزبازی.

**اخلاقی** / 'axlāqî/: [عربی] صفت. ئاکاری؛ ڕەوشتی؛ ڕێ و ڕێباز؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئاکار.

**اخلاقیات** / 'axlāqîyyāt/: [عربی] اسم. خۆ و خدە؛ ڕێ و ڕەوشت؛ ڕێ و ڕێباز؛ کار و باری پێوەندیدار بە ئاکارەوە.

**اخلال** / 'exlāl، ـها/: [عربی] اسم. بشێوە؛ بشێوی؛ ئاڵۆزی؛ پشێوی؛ کردەوەی تێکدان و بە یەکدانی ڕێکوپێکی یان ڕەوتی ئاسایی شتێک ‹دشمنان در انتخابات اخلال کردند: نەیاران لە هەڵبژاردنەکەدا بشێوەیان کرد›.

**اخلالگر** [1] / 'exlālgar، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] اسم. ئاژاوەچی؛ هەڵشێونکە؛ بشێونکار؛ تێکدەری سامان و ئاسایشتی کۆمەڵگا ‹امروز دو اخلالگر دستگیر شدند: ئەورۆ دوو ئاژاوەچی گیران›.

**اخلالگر** [2]: صفت. ئاژاوەچی؛ هەڵشێوێنکە؛ بشێونە؛ بشێونکە؛ کارتێکدەر؛ کارشکێن؛ گێرەشێوێن؛ کارشێوێن؛ شێوەژنە؛ گاشەکار؛ توانا لە پەرێشان‌کردندا ‹او مرد اخلالگری است: پیاوێکی ئاژاوەچیە›.

**اخلالگری** / 'exlālgarî، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. بشێوەکاری؛ بشێونەیی؛ گاشەکاری: ۱. ئاکامی بشێونکاری ‹اخلالگری در انتخابات، موجب ابطال آن شد: بشێوەکاری، دەنگدانەکەی

هەڵشێواندەوە› ۲. دۆخ یان چۆنیەتی بشێوکار بوون ‹چند تن به جرم اخلالگری دستگیر شدند: چەند کەس بە تاوانی بشێونەیی گیران›.

**اخم** / axm': ـها/: اسم. [گفتاری] مۆڕی؛ مۆچی؛ مۆنی؛ گرژی؛ ئەخم؛ ڕووترشی؛ پیخی؛ گەمۆری؛ بەدخەیزی؛ گرێ کەوتنە نێو هەنیەوە و تێکچوونی برۆ بە نیشانەی پێناخۆش بوون، دەرد و خەم یان تووڕەیی.

▣ **اخم کردن**: مۆن کردن؛ گرژکردنی ڕوو؛ ڕوو ترش کردن؛ ناوچاو تاڵ کردن؛ قۆرتانن؛ لچ و لێو گرژکردن؛ ناوچاو ترشانن؛ ناوچاو دانەیەکا؛ ڕوو تاڵ کردن؛ مۆرکەردەی؛ ڕوە دژنەی؛ چەرمەکردن؛ شمۆرکە داژەنین.

**اخم‌آلود** / axmālûd'/: صفت. ۱. ئەخمی؛ ڕووگرژ ۲. ڕووگرژانە؛ بە ڕووگرژیەوە ‹نگاه اخم‌آلود: ڕوانینی ڕووگرژانە›.

**اخمو** / axmû'/: صفت. [گفتاری] گرژ؛ ڕووگرژ؛ ڕوو درژ؛ ڕووترش؛ ڕووکرژ؛ مرومۆچ؛ مۆن؛ مۆڕ؛ گەمۆڕ؛ خمڵوو؛ پیچەو؛ تەڵخ؛ نژمشۆڕ؛ مڕ؛ لمۆڕ؛ ناوچاو ترش؛ ناوچاوتاڵ؛ مرج؛ نمرج؛ مووج؛ ناوچاودێژ؛ ناوچاوگرژ؛ ناوچاو تورشیاگ؛ ڕووتاڵ؛ ڕوو ناخۆش؛ ڕوو هشیک.

▣ **اخموی خودپسند**: باتیزۆک؛ ڕووگرژی خۆ بە زل‌زان.

**اخم‌وتخم** / axm-o-taxm': ـها/: اسم. مڕ و مۆنی؛ چەرمەیی؛ ڕوو گرژی لەگەڵ قسەی بەرز و توندا.

**اخوان** / axavān'/: [عربی] اسم. ۱. دوو برا؛ دوو برادەر ۲. برادەران؛ برایان.

**اخوان** / exvān'/: [عربی] اسم. [نامتداول] برایان؛ برادران.

**اخوانیات** / exvānîyyāt'/: [عربی] جمعِ

☜ **اخوانیّه**

**اخوانیه** / exvānîyye'، اخوانیّات/: [عربی] اسم. نووسراوە، بەتایبەت هونراوەیەک کە دۆستێ بۆ خۆشەویستێکی دەنووسێ.

**اخواوخ** / axu-ûx'، ـها/: اسم. [تعریض] ئاخ و ئۆخ؛ وشەی بە تەنگ هاتن؛ دەربڕینی قین و قەڵسی.

**اخ‌وپیف** / ax-o-pîf'/: اسم. [تعریض] ئیش و ویش؛ دەربڕینی بێزاری ‹قدری اخ‌وپیف کرد، بلکه قیمت را پایین بیاورد: برێ ئیش وویشی کرد، بەڵکوو نرخی بشکێنێ›.

**اخوت** / oxovvat'، ـها/: [عربی] اسم. [ادبی] برایی؛ برایەتی؛ برادەری.

**اخ‌وتف** / ax-o-tof'، ـها/: اسم. [گفتاری] ئاخ‌وتف؛ ئاوی دەم؛ ئاوی قوڕگ و دەم؛ لیک و بەڵغەم.

▣ **اخ‌وتف‌کردن**: ئاخ‌وتف‌کردن: ۱. تف و ئاوی ناو دەم هاویشتنە دەرەوە ۲. [کنایی] ئیش و ویش کردن؛ یەع کردن؛ قەڵسی و بێزاری پیشاندان.

**اخوی** / axavî'، ـها/: [عربی] اسم. ۱. براکەم؛ برای من ‹دیروز اخوی از مسافرت برگشت: دوێنێ براکەم لە سەفەر گەڕایەوە› ۲. برا؛ کاکە؛ ئابرا ‹خدمت اخوی‌تان سلام برسانید: سلاوی براکەت بگەیەنە›.

**اخوی‌زاده** / axavîzāde'، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] اسم. برازا؛ برازاو؛ برازاگ؛ فەرزەن برا؛ مناڵ برا.

**اخیر** / axîr'، اواخر/: [عربی] صفت. دوایین؛ دمایین؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئاخرین ڕۆژانی مانگ یان ساڵانی لەمەو پێش ‹سفر اخیر رییس جمهور به خارج: سەفەری دوایینی سەرۆک‌کۆمار بۆ دەرەوە›.

▣ **در روزهای اخیر**: لەم ڕۆژانەی دواییەدا.

**اخیراً** / axîran'/: [عربی] قید. لەم دواییە؛

چـی دماینـه؛ دواـدوایـی؛ لـه کـاتی نزیـک بـه کـات و سـاتی ئاخـافتن ‹اخیـرا دلار گـران شـد: لەم دواییە دولار گران بوو›.

**اخیرالـذکر** / 'axîrozzekr/: [عربـی] صـفت. دواگوتراو؛ دوایـین نـاوبراو ‹کتاب اخیرالـذکر بارها چاپ شـده اسـت: کتـێبی دواگـوتراو زۆر جـار لـه چاپ دراوەتەوە›.

**اخیـه** / 'ax(i)ye/: [عربـی]/اسـم. ۱. گولـمێخ؛ مـێختـەوێـڵە؛ سـووکە؛ ئاخیـە؛ سـکە؛ ئـارنج؛ ئۆلـک؛ مـێخزنجـیر؛ بزمـاری زل لـە دار یـان ئاسـن ۲. دار یـان تـەنـافێک کـە هـەوساری چوارپێی پێ دەبەسنەوە.

▣ **زیر اخیه کشیدن** ☜ **زیر-۳**

**ادا**/ 'adā/:/اسم. ۱. ـ/ـها/ ئـەدا؛ جووڵاندنـەوەی ئـەنـدامانی لـەش، بـەتایبـەت ڕوومـەت بـە مـەبـەسـتی سـەرنـج ڕاکێـشانی خـەڵـک ‹ادا درآوردن: نـــەدا دەرهێنـــــان› ۲. لاســـــایی؛ دەمـەلاسـکە؛ دەمـەلاسـکێ؛ لاسـاویێ؛ دتـەر؛ زارزارک؛ زارقـە ۳. کـار یـان ڕەوتی بـەجـێ هێنان ‹ادای احترام: حورمەت بەجی هینان›.

▣ **ادا درآوردن**: ۱. ئـین دەرهێنـان؛ لاقرتێـی کـەردەی؛ کـار و جووڵانـەوەی پێکـەنـین‌دار کـردن ۲. لاسـاکردنەوە؛ ئاکـاری کـەسـێ لاسایی و گەمەجاڕ پێ کردن.

**ادا کـردن**: بـەجـێ هێنـان؛ ئـەنجامـدانی ئەرکێک کە بە ئـەستۆی کـەسێکە ‹نماز ادا کردن: نوێژ بە جیٚ‌هینان›.

**ادای کـاری را درآوردن**: بـــە کارێـــک مەرایـی‌کـردن؛ خـۆ وا نیـشاندان ‹لازم نیست ادای نوعدوسـتی را دربیـاوری: پێویـست ناکـا خـۆ بە گەل‌دوست نیشان بدەی›.

**ادای کـسی را درآوردن**: لاسـایی کـەسـێ کردنـەوە: ۱. نیـشاندانی ئاکـار یـان حاڵـەتی کەسێک ۲. ئەو کـارە بـۆ گاڵـتە یـان سـووک و چـرووک‌کـردنی کـەسـێ لـە خـۆ

دەرهێنان.

**ادات** / 'adāt/، ادوات/: [عربـی]/اسـم. [نامتـداول] کەرەسە؛ ئەوراز؛ ئامراز؛ ئالاف؛ ئامێر.

▣ **ادات اسـتفهام**:/دسـتور/ وشـەی پرسـیار (وەک: چگونـه؟ کجـا؟ کـی؟: چـۆن؟ لـە کـوێ؟ کەی؟).

**ادات تـشبیه**:/دسـتور/ واژەی چـوان (وەک: چو، چون، همچون: وەک، وەکوو، هەروەک).

**ادارات** / 'edārāt/: [عربی] جمعِ ☜ **اداره**

**اداره** / 'edāre/: [عربـی]/اسـم. ۱. ـ/ـها؛ ـجات؛ ادارات؛ دوایـر/ دەزگـای دەوڵـەتی؛ مـەزرینگـە؛ دام و دەزگـــای کارگێـــڕی؛ فـــەرمانگـــە؛ کارگێـڕی؛ جێگـەی کـار و بـاری دەوڵـەتی؛ دامەزراوەیەکی (زۆرتـر دەوڵـەتی) بـۆ جێبـەجـێ کـردنی ڕاژەگـەلی گـشتی و دیـاریکراو ‹ادارەی ارشـاد: مـەزرینگـەی ڕۆشـنبیری› ۲. بـەڕێـوە بردن؛ گـەڕان یـان درێـژەی کـار یـان ڕەوتێـک ‹ادارەی زندگی: بەریوە بەردنـی ژیان›.

▣ **ادارەی آتـش‌نـشانی**: مــەزرینگــەی ئاگرتەمرێن.

**ادارەی آگـــاهی**: دایـــرەی ئاگـــایی؛ مەزرینگەی ئاگایی.

**ادارەی احـصائیه**:/قـدیمی/ کارگێـڕی ئامـار؛ مەزرینگەی ژمێرکۆ.

**ادارەی اوقاف**: مەزرینگەی ئەوقاف.

**ادارەی ثبـت احـوال**: ژینووســـگە؛ مەزرینگەیەک کە ئاگـەداریگـەلی سـەبارەت بـە لـە دایـک بـوون و مـردنی خەڵـکی وڵات تۆمار دەکـا و پێناسەیان بۆ دەردێنێ.

**ادارەی ثبـت اختراعـات**: مــەزرینگــەی تۆمارکردنی داهێنراوەکان.

**ادارەی ثبت اسناد**: مـەزرینگـەی تۆمـاری بەڵگە؛ بەڕێوەبەرایەتی بەڵگە.

**ادارەی ثبـت امـلاک**: کارگێـڕی قـەباڵـەی مولک نووسین؛ بەڕێوەبەرایەتی تاپۆ.

**ادارەی ثبت شرکتها:** مەزرینگەی تۆماری ناوکۆ؛ مەزرینگەی تۆماری بەشدارگە.

**ادارەی تدارکات:** کارگێڕی ئابوورەمەنی؛ مەزرینگەی دابینکاری.

**ادارەی دارایی:** دارایی؛ کارگێڕی باج و پیتاک ساندن.

**ادارەی دولتی:** دامەزراوەی دەوڵەتی؛ دام و دەزگای سەر بە میری.

**ادارەی راهنمایی** ☜ **ادارەی راهنمایی و رانندگی**

**ادارەی راهنمایی و رانندگی:** مەزرینگەی ڕێبوورین؛ دەم و دەزگایەک کە کاری چاوەدێری و ڕێکخستنی هاتوچووی ناو شەقامەکانە: **ادارەی راهنمایی**

**ادارەی کل:** مەزرینگەی گشتی.

▣ **اداره شدن:** بەڕێوە چوون ‹با این حقوق زندگی‌اش اداره نمی‌شود: بەم مووچە ژیانی بەڕێوە ناچێ›.

**ادارەبازی** / 'edārebāzî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئیدارەگەری؛ مەیل بە پەرە پێدانی مەزرینگە و ڕێوڕەسمی مەزرینگەیی.

**ادارەجات** / 'edārecāt/: [عربی] جمعِ ☜ **اداره**

**ادارەجاتی** / 'edārecātî، ـها/: [عربی]/اسم. *[گفتاری]* مووچەخۆر؛ کارمەند؛ بەتایبەت کارمەندی دەوڵەت.

**اداری**/ 'edārî/: [عربی] صفت. مەزرینگەیی: ۱. ئیداری؛ سەر بە مەزرینگە ۲. /ـها/ ئەندام یان مووچەخۆری کارگێڕی.

**ادامه** / 'edāme/: [عربی]/اسم. درێژە؛ تەرەک: ۱. پاشماوە؛ دمامەنە؛ دواء؛ دما ‹ادامەی داستان: پاشماوەی چیرۆک› ۲. لەسەر ڕۆیی؛ کار یان ڕەوتی شوێن کەوتنی کارێ ‹او بە خواندن درسش ادامه داد: بە خوێندنی وانەکەی درێژەی دا›.

▣ **ادامه دادن:** درێژە پێدان؛ بە شوێن چوون؛ هەروا بن گرتن؛ پێداچوون.

**ادامه داشتن:** درێژەدار بوون؛ دوادار بوون.

**ادامه یافتن:** درێژە پەیداکردن؛ بەردەوام بوون؛ دوایی نەهاتن و هەروەها لە گەڕاندا بوون ‹تیراندازی ادامه یافت: تیرهاوێژی درێژەی پەیداکرد›.

**اداواصول** / 'adā-vo-'usûl, -'osûl، ـها/: [عربی]/اسم. *[تعریض]* فرمەسۆنی؛ ئاکار و جوولانەوەی نائاسایی بە نیشانەی ئۆگرەتی بە تەشریفاتەوە.

▣ **ادا و اصول درآوردن:** فرمەسۆنی کردن. هەروەها: **ادا و اصول داشتن**

**اداواطوار** / 'adā-vo-'atvār، ـها/: [عربی] اسم. *[تعریض]* ئەداو ئەتوار؛ ئاین و ئۆین؛ کردەوەیەکی شانۆیانە بۆ سەرنج ڕاکێشان.

▣ **ادا و اطوار درآوردن:** ئەدا و ئەتوار دەرهاوردن؛ ئاین و ئۆین نواندن.

**ادب** / 'adab، آداب/: [عربی]/اسم. ئەدەب: ۱. هۆرتە؛ ڕست؛ داب؛ ئەیەو؛ ئیەو؛ مخت؛ کار و کردەوەی شیاو و گونجاو، هاوسەنگی بایەخگەلی پەسندکراو ۲. *[قدیمی]* وێژە؛ تۆرە ۳. *[قدیمی]* ڕێ و ڕەوشتی هەرکارێک.

▣ **ادب داشتن:** بە کردەوەی شیاو بوون؛ ڕێ و ڕەوشت زانین.

**ادب شدن:** ژیر بوون: ۱. ڕاهاتن بە هەڵس و نشستی شیاو؛ ڕێ و ڕەوشت فێر بوون ۲. *[مجازی]* تەنبێ بوون.

**ادب کردن:** ۱. ڕێ و ڕەوشت فێرکردن ۲. *[مجازی]* تەنبێ کردن؛ ژیرکردن.

**ادبا** / 'odabā/: [عربی] جمعِ ☜ **آدیب**

**ادبار** / 'edbār/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* هەژاری؛ بەلەنگازی؛ ڕۆژڕەشی؛ کوێرەوەری؛ بەدبەختی.

**ادب‌پـــــــرور** / adabparvar'، ـان/: [عربـــی/ فارســـی] صـفت. وێـــژه‌پـــه‌روه‌ر؛ لایـــه‌نگـــر و پشتیوانی زمان و وێژه.

**ادب‌پیـــشه** / adabpîše'، ـــگـان/: [عربـی/ فارسـی] صفت. وێژه‌کار؛ خاوه‌ن چالاکی له وێژه‌دا.

**ادبـــی** / adabî'/: [عربـــی] صـــفت. وێـــژه‌یـــی؛ ئـــه‌ده‌بی؛ چۆنیـــه‌تی وتـــه یـــان نووســـراوه‌یه‌ک که پێوه‌ندی به وێژه‌وه هه‌بێ.

◘ **ادبـی حـرف زدن**: ئـه‌ده‌بی قسـه‌کـردن؛ بـه شێوه‌ی نووسین ئاخافتن.

**ادبیـــات** / adabîyyāt'/: [عربـــی]/اســـم. وێـــژه؛ بێـــژه؛ تـــووره: ١. کۆمـــای ڕامـــان و ڕانـــانی هونه‌ری گه‌لێـک کـه لـه چـوار چێـوه‌ی وتـاردا جێگر بووه ٢. کۆمـه‌ڵـه نووسـراوه‌گـه‌لێـک کـه شـێوازی گوتنـه‌وه، یـان بـیر و بۆچوونـه‌کانیـان جێگـــای پـــه‌ســـندی بـــه‌ره‌ی داهـــاتوو یـــان گه‌لانی جۆراوجۆری وڵاتانی دیکه بێت.

◘ **ادبیـات تطبیقـی**: وێـژه‌ی بـه‌راوردی؛ لقێـک لـــه وێـــژه‌ی نێونه‌تـــه‌وه‌یی کـــه باســـی کـــارتێکردنی وێـــژه‌ی گـــه‌لێـــک بـــه ســـه‌ر گه‌لێکی تردا، یـان شـێوازگه‌لی جیـاواز بـه‌ڵام له یه‌ک چه‌شنی وێژه‌ی وڵاتان ده‌کا.

**ادبیـات سیاه**: وێـژه‌ی ڕه‌ش؛ وێـژه‌یـه‌ک کـه قـــسه لـــه مـــردن و چـــاره‌ڕه‌شـــی مـــرۆ و بێ‌ئه‌مه‌گی دنیا ده‌کا.

**ادبیـات شـفاهی**: وێـژه‌ی زاره‌کـی؛ وێـژه‌وانی ســه‌رزاره‌کـی؛ کۆمــه‌ڵـه‌ی چـیرۆک، کایــه، گـــۆرانی، لیچـــار و مـــه‌تـــه‌ڵـــۆک و... کـــه پشتاوپشت ده‌گێڕدرێنه‌وه.

**ادبیـــات کلاســـیک**: وێـــژه‌ی کلاســـیک؛ ئه‌ده‌بی کۆن؛ به‌رهـه‌مـی وێـژه‌وانـانی گـه‌وره و له مێژینه‌ی هه‌ر نـه‌تـه‌وه‌یێـک. هـه‌روه‌هـا: **ادبیـــات کهـــن؛ ادبیـــات معاصـــر؛ ادبیـــات مکتوب؛ ادبیات منظوم**

**ادرار** / edrār'/: [عربـی]/اسـم. میـز؛ مێـز؛ گمێـز؛ چـــوڕ؛ چرگـــه؛ پێـــشاو؛ زاراو؛ ژاراو؛ تـــراوی ده‌رهـــاتوو لـــه گورچیلـــه‌ی گوانـــداران کـــه ده‌تکێتـــه میـــزه‌ڵـــدان و لـــه‌وێـــوه ده‌ڕژێتـــه ده‌ره‌وه.

**ادراک** / edrāk'، ـهـا؛ ـات/: [عربـی]/اسـم. ڕه‌وتی تێگـه‌یـشتن؛ هـه‌سـت پـێ کـردن؛ پێ‌زانین؛ چنه‌یاوه‌ی.

**ادعـــا** / edde'ā'، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ١. داوا؛ خـــوازه؛ وتـــه‌یـــه‌ک کـــه دروســـتی یـــان نادروسـتیه‌کـه‌ی نـه‌سـه‌لمـاوه ٢. *[گفتاری]* خـۆ هـه‌ڵکێـشان ٣. *[حقـوق]* داوا؛ خـوازه؛ داخـواز؛ داخوازه ※**دعوت**

◙ **ادعـای برحـق**: خـوازه‌ی ڕاسـت و دروسـت. هه‌روه‌ها: **ادعای ناحق**

◘ **ادعا داشتن**: ١. هـاش‌وهـووش کـردن؛ شـات و شـــووت‌کـــردن؛ لاف و گـــه‌زاف لێـــدان؛ دداندن ٢. خـۆ هـه‌ڵکێـشان؛ بـه خـۆ نـازین؛ خۆ هه‌ڵخستنه‌وه؛ خۆ هه‌ڵدان.

**ادعا کردن**: داواکردن؛ ئیدعاکردن.

**ادعائی** / edde'âî'/ ☜ **ادعایی**

**ادعانامـه** / edde'āname'، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] اسم. *[حقوق]* خوازه‌نامه؛ داوانامه؛ ئیدعانامه.

**ادعـــایی** / edde'āyî'/: [عربـی] صـفت. داواکـراو؛ خـــوازه‌یـــی ‹زمـین ادعـایی مـال او نیـست: زه‌ویـه داواکراوه‌که هی ئه‌و نیه›: **ادعائی**

**ادعیه** / ad'iye'/: [عربی] جمعِ ☜ **دُعا**

**ادغـام** / edqām'، ـها/: [عربـی]/اسـم. تێکـه‌ڵـی؛ ئاوێتـــه‌یـــی؛ تێـــوه‌چـــوونی؛ کـــار یـــان ڕه‌وتی پێوه‌لکان و بوونه یه‌کی دوو یان چه‌ند شت.

◘ **ادغـام شـدن**: تێکـه‌ڵ بـوون؛ ئاوێتـه بـوون؛ تێوه‌چوون؛ پێکه‌وه لکان.

**ادغـام کـردن**: ئاوێتـه‌کـردن؛ تێکـه‌ڵ‌کـردن؛ تێک‌بردن.

**ادکلـــــن** / od(o)kolon'/: [فرانـــسوی]/اســـم. ئودکولون؛ تێکه‌ڵی عـه‌تـر و ئـه‌لکـول و ئـاو کـه

دەبێتــە تراوێکــی بــۆنخــۆش: **ادکلنـــی؛ اودوکلنی**

**ادکلنی** / 'odkolonî/: [فرانسوی] ☜ **ادکلن**

**ادله** / 'adelle/: [عربی] جمعِ ☜ **دلیل**

**ادوات** / 'adavāt/: [عربـــی]/اســـم. ۱. جمــعِ ☜ **ادات** ۲. ئامراز؛ کەلوپەل؛ کەرەستە.

**ادوار** / 'advār/: [عربی] جمعِ ☜ **دَوره**

**ادواری** / 'advārî/: [عربــی] صـفت. مــاوەیــی؛ زڤــڕانی؛ گــەڕوەگــەڕی؛ خــاوەن دۆخ یــان چۆنیــەتی دووپـات بوونــەوە لــە مــەوداگــەلی کاتیدا.

**ادونتیـــست** / 'adventîst/: [انگلیـــسی] صـــفت. ئەدوێنتیست؛ پەیڕەوی ئەدوێنتیسم.

**ادونتیـــسم** / 'adventîsm/: [انگلیـــسی]/اســـم. ئە دوێنتیسم؛ لـە ڕێبازگـەلی خاچپـە رسـتی لـە ئامریکـا، کـە گـەڕانـەوەی مـەسـیح بـە نزیـک دەزانــن و چینێکیــان ڕۆژی شــەمــەیــان لــە لا پیرۆزە.

**ادویـــه** / 'adviye، ـــجـات/: [عربـــی]/اســـم. ۱. جمــعِ ☜ **دَوا** ۲. ئــەدوا؛ بــەهــارات؛ ئــەزوا دەرمانــک؛ هــەزوێلــە؛ داودەرمــانی چێــشت خۆشـــکەر (وەک ئالـــەت و زەردەچێـــوە) ۳. *[قـــدیمی]* دەوا؛ دەوا و دەرمـــانی گیـــایی (وەک عەناب و خاکشیر).

**ادویـــەجـــات** / 'adviyecāt/: [عربـــی] جمـــعِ ☜ **ادویه**

**ادیان** / 'adyān/: [عربی] جمعِ ☜ **دین**

**ادیـــب** / 'adîb، ـــان؛ ادبـا/: [عربـــی]/اســـم. ۱. وێــژەوان؛ تــوورەوان؛ وێــژەنــاس؛ ئــەدیــب ۲. نووسەر یان شاعیر.

**ادیبانـــه** / 'adîbāne/: [عربـــی/ فارســـی] صـــفت. وێژەناسانە؛ وێژەیی؛ وێژەوانە؛ وێژەوانیانە.

**ادیپ** / 'odîp/: [؟] ☜ عقدەی ادیپ، **عقده**

**ادیـــت** / 'edît/: [انگلیـــسی]/اســـم. نویـــسیاری؛ نڤیسیاری؛ ویرایش.

▣ **ادیــت کــردن**: نویــسیاریکــردن؛ ویــرایش کردن.

**ادیتـــور** / 'edîtor/: [انگلیـــسی]/اســـم. نویـــسیار؛ نڤیسیار؛ ویراستار.

**اذان** / 'azān/: [عربـی]/اسـم. بانـگ؛ بـان؛ بـانگی نوێژ.

▣ **اذان صبح**: بـانگی بـەیـانی. هـەروەهـا: **اذان ظهر؛ اذان عصر؛ اذان مغرب؛ اذان عشا**

**اذان و اقامه** ☜ **اقامه ـ۲**

**اذانگـــو** / 'azāngû، ـهـا؛ ـیـان/: [عربـی]/اسـم. بانگبێژ؛ بانگوێژ؛ بانگهەڵدەر؛ بانگدەر.

**اذعـان** / 'ez'ān/: [عربـی]/اسـم. پـێهـاتن؛ ددان پێدانیان؛ پنــە ئامــەی؛ ڕەوتی قــەبــووڵکــردن و ڕاگـــەیانـــدنی ڕاســـتی و دروســـتی بـــیر و بۆچوونی پێچەوانەی خۆ.

**اذکار** / 'azkār/: [عربی] جمعِ ☜ **ذِکر**

**اذن** / 'ezn/: [عربـــی]/اســـم. *[ادبـــی، نامتـــداول]* ئیـزن؛ ئیجـازە؛ بـەرایـی. هـەروەهـا: **اذن دادن؛ اذن داشتن**

**اذنـاب** / 'aznāb/: [عربـی]/اسـم. *[مجازی]* دەسـە و دایـرە؛ دەسـتو پێـوەنـد؛ دەسـەوبـەسـە؛ کەسانێک کـە دەبنـە داردەسـتی کـەسێ یـان پێگەیێک و شوێنکەوتووی ئەون.

**اذهان** / 'azhān/: [عربی] جمعِ ☜ **ذِهن**

▣ **اذهــان عمــومی**: بـیری گـشتی؛ بـیر و ڕای هەمـووانی ‹اذهـان عمومی از او برگـشت: بـیری گشتی لێ هەڵگەڕایەوە›.

**اذیـــت** / 'azîyyat, 'azyat، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ئـاران؛ ئـازار؛ عـەزیـەت؛ چوکـڵەچـزی؛ چـز؛ تەنگ؛ ژەنگ؛ وەزەنگ.

▣ **اذیــت دیــدن**: ئـازار بیـنین؛ ئـازار دیـتن؛ دەرد چـەشـتن؛ عـەزاو پـێگـەیـشتن؛ ئـێش پـێگـەیـشتن؛ گـەهـران. هـەروەهـا: **اذیـت شدن**

**اذیـــت کـــردن**: ئارانـــدن؛ ئێـــشاندن؛

ئێشنەی؛ چزانن؛ چلنگانن؛ ئازار دان؛ گەهراندن؛ عەزاو دان. هەروەها: **آزردن**

**ار** / ar'/: *قید. [مخفف، ادبی]* گەر؛ ئەر؛ ئەگە؛ هەگە؛ هەکە؛ ئەگەر؛ هەگەر.

**ارائه** / erā'e'/: [عربی]*اسم.* ۱. پیشان‌دەری؛ نوێنی؛ کار و ڕەوتی نیشان‌دان؛ ڕانان؛ ئرمانەی ‹شناسنامەها را ارائه دادند: ناسنامەکانیان پیشان‌دا› ۲. کار یان ڕەوتی نیشان دان؛ ڕاگە یاندن ‹وکیل مدافع دلایل خود را ارئه داد: پاریزەر بەڵگەکانی خۆی ڕاگەیاند›.

▣ **ارائه‌ی طریق**: ڕێنوێنی؛ ڕێنموونی.

▣ **ارائه دادن**: پیشان‌دان؛ نیشان‌دان؛ شان‌دان؛ نواندن.

**ارائه کردن**: پیشان‌دان؛ نیشان‌دان؛ شان‌دان؛ نواندن؛ ئرمانەی.

**ارابه** / arrābe'/ ـها/: *اسم.* ئەڕابە؛ گاریە؛ گاری؛ عەرەبانە؛ ئارەبانە: **عَرّابه**

▣ **ارابه‌ی جنگی**: ئەڕابەی شەڕ؛ دەبابەی شەڕ.

**ارابه‌ران** / arrāberān'/: *اسم.* /ـها؛ ـان/ دەبابەچی؛ شۆفێری عەڕابە؛ ڕانەندەی ئارەبانە.

**ارابه‌رو** / arrāberow'/: *صفت.* ڕێگەی ئەڕابە؛ ئەڕابەڕۆ.

**اراجیف** / arācîf'/: [عربی]*اسم.* ۱. قۆڕیات؛ قسەی پووچەڵ و بەتاڵ؛ قسەی قۆڕ؛ هەلەق‌مەلەق ۲. قسەی نابەجێ و ناشیرین.

**ارادت** / erādat'/: [عربی]*اسم.* ۱. سەرسپێری؛ دۆستی و خۆشەویستی وێڕای باوەڕ و پەرمان بە کەسێکی سەرتر لە خۆ ۲. *[قدیمی]* پەیڕەوی؛ شوێن‌کەوتوویی.

▣ **ارادت داشتن**: سەرئەسپێر بوون؛ سەرسپێراو بوون؛ لایین تواسن.

**ارادتمند** / erādatmand'/: [عربی/ فارسی] *صفت.* سەرسپێراو؛ سەرئەسپێراو. هەروەها: **ارادتمندی**

**ارادتمندانه** / erādatmandāne'/: [عربی/ فارسی] *قید.* سەرسپێرانە؛ بەسەرسپێراوی؛ بە سەرئەسپێراوی.

**اراده** / arrāde'/: [از عربی]*اسم.* /ـها/ ۱. پێچکە؛ چەرخی گاری و عەڕابە و... ۲. *[مجازی]* چەرخی ژیان ‹کارش بد نیست و اراده‌اش می‌چرخد: کاری خراپ نیە، چەرخی ژیانی دەگەڕێ›.

**اراده** / erāde'/ ـها/: [عربی]*اسم.* ئیرادە: ۱. هێزی زاڵ بە سەر کار و هەناودا ‹اراده‌ی آهنین: ئیرادەی پۆڵایین› ۲. هێز و پێزی زەینی بە شێوەی هەڵبژاردن، ئۆگرەتی یان گەرەک بوون ‹برای ترک سیگار اراده لازم است: بۆ وەلانانی جگەرە ئیرادە پێویستە› ۳. لە خۆ نەوین؛ لە خۆ بڕیان؛ گەرەک؛ خواز؛ واز؛ هۆگری زەینی بۆ بە شوێندا چوونی کارێکی دیاریکراو ‹اگر اراده کنی موفق می‌شوی: ئەگەر لە خو بنەوی سەردەکەوی›.

▣ **اراده‌ی استوار / آهنین**: ویستی پتەو؛ بڕیاری پتەو: **اراده‌ی خلل‌ناپذیر**

**اراده‌ی خلل‌ناپذیر** ☜ **اراده‌ی استوار/ آهنین**

▣ **اراده کردن**: لە خۆ نەوین؛ ویستن؛ گەرەک بوون؛ هەرەک بوون؛ خواستن؛ وازیەی.

**اراده‌گرایی** / erādegerāyî'/: [عربی/ فارسی] ☜ **وڵونتاریسم**

**ارادی** / erādî'/: [عربی] *صفت.* خواستی؛ ویستیانە؛ ئاگایانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە ویست ‹رفتار ارادی: کردەوەی خواستی›.

**اراذل** / arāzel'/: [عربی] جمعِ ☜ **رذل**

**اراضی** / arāzî'/: [عربی] جمعِ ☜ **ارض**

**ارامنه** / arāmane'/: جمعِ ☜ **ارمنی**

**ارانگوتـــان** / orāngotān'، ـهـا/: [انگلیـــسی] /اسم. ئـوران‌ئوتـان؛ ئورانـگ‌ئوتـان؛ جـۆرێ مـەیمـوونی تـووک نـەرمـی دەسـت‌درێـژە: **أورانگ أوتان؛ أوران أوتان**

**اربـــاب** / arbāb'، ـهـا؛ ـان/: [عربـی] /اسم. ١. خـاوەن؛ خێـو؛ ئاغـا؛ ئـەرواو ٢. خودایـان ٣. خـاوەنـان ‹ارباب جراید: خـاوەن قـەڵـەمـان› ٤. خاوەن‌کار؛ ساحێوکار؛ پرگاڵ.

▣ **ارباب انواع**: جمعِ ☜ **رب‌النوع**

**اربـاب جرایـد**: ڕۆژنامـەنووسـگەل؛ خـاوەن قەڵەمان.

**ارباب ده**: خاوەن دێ؛ خێوی گوند.

**ارباب رجوع**: کارێنەر؛ کەسێ کـە بـۆ کـارێ دەچێتـە شـوێنێ (بـەتایبـەت مـەزرینگـەی دەوڵەتی).

**ارباب علم**: زانایان؛ زانیاران؛ زانستمەندان.

▣ **اربـاب خـود بـودن**: /کنایی/ ئاغـای خـۆ بوون؛ ژێر دەستی کەس نەبوون.

**اربابانـه**[1] / arbābāne'/: [عربـی/ فارسـی] /اسم. بهرەی مالکانه ☜ **بهره**

**اربابانـه**[2]: صفت. ئاغایانـە؛ سـانانە؛ وەکـوو ئاغـا ‹رفتار اربابانه: ئاکاری ئاغایانە›.

**اربـاب‌مـنش** / arbābmaneš'/: [عربـی/ فارسـی] صفت. خـۆی خانانـە؛ خـان‌ئاسا؛ خـاوەن خـۆ و ئاکاری وەک ئاغایان. هەروەها: **ارباب‌منشانه**

**اربــــاب‌ورعیتـــــی** / arbāb-o-ra'îyyatî'/: [عربـی] /اسم. دەرەبـەگایـەتی؛ دەزگایـەکـی کۆمـەڵایـەتی و ئـابووری کـە بـەگ خێـوی هەموو شتێکە و بە کەڵـک وەرگـرتن لـە کـاری ڕەنجبـەر، بـەرهـەمـی زیـادەی دەسـت دەکەوێ.

**اربـابی**[1] / arbābî'/: [عربـی] /اسم. ئاغـایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ئاغا بوون.

▣ **اربـابی کـردن**: ئاغـایی کـردن؛ دێـداری کـردن: ١. داخـوڕین و فـەرمـان‌دان ٢. بەخشین و جوامێری کردن.

**اربابی**[2]: صفت. ئاغـایی؛ ئاغایـەتی؛ پێـوەندیـدار یان سەر بە ئاغا ‹خانەی اربابی:ماڵی ئاغایی›.

**اربعــه** / arba'e'/: [عربـی] صفت. چواردانـەیـی؛ چوارە؛ خاوەن چوار ئەندام یان چوار توخم.

**اربعـــین** / arba'în'، ـهـا/: [عربـی] /اسم. ١. /نامتداول/ چـل ٢. چلـە؛ چلـێ؛ چـل ڕۆژ دوای مـردنی کـەسـێک ٣. ڕۆژی بیـستەمـی مـانگی سەفەر؛ چلەی حوسەینی.

**اربیتـــال** / orbîtāl'، ـهـا/: [فرانـسوی] /اسم. /شـیمی/ ئوربیتـــاڵ؛ هـــەوری ئلیکتـــرۆنی؛ هەورئاســـایەک کـــە ئلیکتـــرۆن بـــە هـــۆی ســـووڕخواردنی یـــەکجار خێـــرا بـــە دەوری نـــاوکی ئەتومـــدا بـــەدی دێنـــێ: **آشـــیانەی الکترون**

**اربـــیم** / erbiyom'/: [فرانـسوی] /اسم. ئیربیـۆم؛ تـوخمی کیمیـاوی کـانزایی لـە دەسـتەی لانتانیدەکان بە ژمـارەی ئـەتـومی ٦٨ و کێـشی ئەتومی ١٦٧,٢٦.

**ارتبـــاط** / ertebāt'، ـهـا؛ ـات/: [عربـی] /اسم. پەیوەندی؛ پێـوەنـدی: ١. پێـوەنـد ٢. کـەیـن و بـەیـن؛ ڕەوتێـک کـە دەبێتـە هـۆی ئـاڵوگـۆڕ کـردنی زانیـاری ‹ارتبـاط تلفنـی: پێـوەنـدی تەلەفوونی›.

▣ **ارتباط تصویری** ☜ **گرافیک**

▣ **ارتباط دادن**: پەیوەندی‌دان؛ پێوەنددان.

**ارتبـاط داشـتن**: پـەیـوەنـدی هـەبـوون: ١. پێکـەوە نێوانـدار بـوون ‹همـه بـا هـم ارتبـاط داریـم: گـشتمان پێـکەوە پێـوەنـدیمان هـەیـە› ٢. پێـوەندیـدار بـوون؛ پێـوەسـت بـوون ‹کـار من به شما ارتباط نـدارد: کـاری مـن پێـوەنـدی بـە ئێوەوە نیە›.

**ارتباط گـرفتن**: پـەیـوەنـدی‌گـرتن؛ پێـوەندیـدار بوون. هەروەها: **ارتباط یافتن**

**ارتباطـــــات** / ertebātāt'/: [عربـــی] /اســـم.

پێـوەندیگـەل: ١. ئاگـەداری و پێـوەندیگـەلی ئـاڵوگـۆڕکراو ٢. شـێواز و سیـستەمـی دامەزرانـدنی پێـوەنـدی. هـەروەهـا: **ارتباطـات بانکی؛ ارتباطات راه دور؛ شبکەی ارتباطات**

**ارتبـاطی** / ertebātî'/: [عربـی] صـفت. پێوەندی؛ بـە تایبـەتـمەنـدی یـا چۆنـاوچۆنی پێـوەندیـدار کردنـەوە ‹راە ارتبـاطی: ڕێگـەی پێوەندی›.

**ارتجـاع** / 'erteca'/: [عربـی] اسـم. ١. کـێش‌ئاسایی؛ گـەڕانـەوە بـۆ دەقـی سـەرەتـا ٢. کۆنـەپـەرسـتی؛ کۆنـەبـیری؛ بـیر و بـڕوای کۆنەپەرست.

**ارتجـاعی** / 'erteca'î/: [عربـی] صـفت. ١. کـێش‌ئاسـا ٢. کۆنـەپـەرستانە ‹فکـر ارتجـاعی: بیری کۆنەپەرستانە›.

**ارتجـال** / 'ertecāl/: [عربـی] اسـم. [ادبـی] دەسـبەجێیـەتی؛ ڕێـوڕایی؛ کـار یـان ڕەوتی بێ‌گت قسە دانان یان هەڵبەست هۆنینەوە.

**ارتجـالاً** / 'ertecālan/: [عربـی] قیـد. دەسـبەجێیانـە؛ ڕێوڕایانـە؛ بـە شـێوەی ڕاستەوخۆ و بە بێ لێ‌ڕاوەستان.

**ارتجـالی** / 'ertecālî/: [عربـی] صـفت. دەسـبەجـێ؛ ڕێـوارا؛ سـەرپێیـی ‹شعر ارتجـالی: شیعری دەسبەجی›.

**ارتحـال** / 'ertehāl/: [عربـی] اسـم. [ادبـی] ١. مردن؛ مەردەی ٢. [نامتداول] کۆچ.

**ارتـداد** / 'ertedād/: [عربـی] اسـم. کـاری گـەڕانـەوە؛ هـەڵـگەڕانـەوە؛ وەرگـەڕان و چاوپۆشان لە دین یان ئایینی خۆ.

**ارتـدکس** / 'ortodoks/، ـهـا: [فرانسوی] اسـم. ئورتـودۆکس: ١. کـەسـێ کـە پـەیـڕەوی کلێـسەی ئۆرتۆدۆکـسە ٢. کـەسـێ کـە شوێنگری ئایینی کۆنە * **ارتُودوکس**

**ارتـزاق** / 'ertezāq/: [عربـی] اسـم. [ادبـی] کـار یـان ڕەوتی بژیـو پـەیـدا کـردن؛ بـە دەسـت هێنانی خواردەمەنی.

**ارتـش** / 'arteš/، ـهـا/: اسـم. قوشـوون؛ سـپا؛ ئارتەش: ١. سـەرجـەم ڕێخـراوەی چـەکـداری وڵاتێـک ٢. یـەکـەیێکـی چـەکـداری ٣. کۆمەڵەیەکـی گـەورە لـە چـەکـدارانی ڕاهـاتوو بۆ شەڕ، بەتایبەت لە وشکانیدا.

**ارتـشا** / 'erteša/: [عربـی] اسـم. [ادبـی] بەرتیل‌خۆری؛ بەرتیل‌گری.

**ارتـشبد** / 'artešbod/، ـهـا/: اسـم. ئـەرتـەشـبود؛ بەرزترین پلەی ژنراڵی لە ئەرتەشی ئێران.

**ارتـشبدی** / 'artešbodî/: اسـم. ئـەرتـەشـبودی؛ بەرزترین پلەی چەکداری لە ئێران.

**ارتـشتار** / 'arteštār/، ـان/: اسـم. [ادبی] سـپایی؛ سوپایی؛ ئارتەشی.

**ارتـشتاران‌فرمانـده** / 'arteštārānfarmāndeh/: اسم. فەرماندەی گشتی؛ فەرماندەری گشتی.

**ارتـشسـالاری** / 'artešsālārî/: اسـم. سـپامەزنی؛ ڕژیمـی زەبـر و زەنگـی ئەرتەشیان.

**ارتـشی**[1] / 'artešî/، ـهـا؛ ـان/: اسـم. سـپایی؛ قۆشەنی؛ ئەرتـەشـی؛ نیزامـی؛ کـەسـێ کـە لـە ئەرتەشدا کار دەکا.

**ارتـشی**[2]: صفت. ئـەرتـەشـی؛ پێـوەندیـدار یـان پاڵدراو بە ئـەرتـەشـەوە ‹ماشین ارتـشی: ماشـێنی ئەرتەشی›.

**ارتعـاش** / 'erte'āš/، ـهـا؛ ـات/: [عربـی] اسـم. لـەرە؛ لـەرزە: ١. دیـاردە یـان ڕەوتی لـەرزە ٢. لەرزان؛ لەران؛ ڕاژان.

◙ **ارتعاش صـوت:** لـەرەی دەنـگ؛ لـەرینـەوەی دەنگ.

**ارتعاشـی** / 'erte'āšî/: [عربی] صفت. لـەرزانی؛ لەرانی؛ پێوەندیـدار بـە لـەرەوە ‹حرکـت ارتعاشـی: بزووتنی لەرزانی›

**ارتفـاع** / 'ertefā'/، ـهـا؛ ـات/: [عربـی] اسـم. بـڵندی؛ بـڵندایی؛ بـەرزی؛ بلنگـی؛ چـۆڕۆ: ١.

مەودای ئەستوونی تەن یان شوێنێک لە جێگای ئەندازەگرتنەوە، بە پێی یەکەی درێژایی ‹ارتفاع آب: بلندی ئاو› ۲. *[مجازی]* بەرزایی؛ جێگای بەرز (وەک تەپکە و کێو) ‹روی یک ارتفاع بایست تا بتوانی خوب ببینی: لە سەر بەرزاییەکەوە ڕاوەستە با باش ببینی› ۳. ڕادەی قەوەتی دەنگ ‹ارتفاع صدا: بەرزی دەنگ›.

**ارتفاعات** / ertefā'āt': [عربی] /اسم/. بەرزاییگەل؛ بڵنداییگەل؛ هەورازان؛ کاس؛ جێ و شوێنی (وەک کێو و تەپۆڵکە) وا لە دەور و بەریان بەرزترن ‹در ارتفاعات برف باریده: لە بەرزاییگەلدا بەفر باریوە›.

**ارتفاع‌سنج** /ertefā'sanc، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم/. هەورازپێو؛ ئامرازی نیشاندانی بەرزایی شوێنێک لە چاو زەریا.

**ارتفاع‌یابی** / ertefā'yābî'، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم/. کار یان ڕەوتی بە دەست هێنانی مەودای ئەستێران و بەرزاییان لە ئاسۆوە.

**ارتفاق** / ertefāq'/: [عربی] ☜ حق ارتفاق، **حق**

**ارتقا** / erteqā'، ـها/: [عربی] /اسم/. ڕەوتی چوونە سەر؛ بەرزەوە بوون؛ گەشە پێدان یان گەشەکەکردن. هەروەها: **ارتقا دادن؛ ارتقا یافتن**

▣ **ارتقای درجه:** *[نظامی]* پلەک گرتن؛ پلەک چوونە سەرەوە.

**ارتقای مقام:** بەرزتر بوونەوە؛ پایە چوونە سەر.

**ارتکاب** / ertekāb'/: [عربی] /اسم/. دەستپێیداچوون؛ کار یان ڕەوتی تووش بوونی گوناهـو تاوان.

**ارتماسی** / ortopedî'/ ☜ غسل ارتماسی، **غسل**

**ارتوپد** / ortoped'، ـها/: [از فرانسوی] /اسم/. ئۆرتۆپید؛ بژیشکی پسپۆڕی ئێسک و جمگە.

**ارتوپدی** / ortopedî'/: /اسم/. ئۆرتۆپیدی؛ کاری تێک خستنەوەی ئێسکی شکاوی لەش و دەرمانگەلی سەر بە ئێسک.

**ارتودکس** / ortodoks'/: [فرانسوی] ☜ **اُرتُدُکس**

**ارتودنسی** / ortodensî'/: [فرانسوی] /اسم/. *[پزشکی]* ئۆرتۆدێنسی؛ لە پسپۆڕیگەلی ددانبژیشکی.

**ارث** / ers'، ـها/: [عربی] /اسم/. ۱. کەلەپوور؛ کەلوپوور؛ کەلەپوور؛ کەرەپوول؛ کالکی؛ میرات؛ میراس؛ مەردەلا؛ هشتە؛ ئیرس؛ پاشماوە؛ دمامەنە؛ دارایی لە مردگ جێ ماو ۲. هەر کام لە تایبەتمەندیگەلی لەشی (یا خوویی) کە لە باوک، دایک یان پیرانەوە دەگاتە زارۆ (وەک ڕەنگی پێست یان چاو).

▣ **ارث بردن:** میرات بردن؛ میرات بەرکەوتن ‹دختر یک سهم ارث می‌برد، پسر دو سهم: کچ بەشێک میرات دەبا، کوڕ دووبەش›.

**ارث پدر خواستن/ طلب داشتن:** *[کنایی]* داوای بەشی باوک کردن؛ بابێنی ویستن؛ داوای میرات کردن؛ پێداگری بۆ ویستنی شتێ.

**ارث رسیدن:** میرات پێ گەیشتن.

**ارث شغال به کفتار رسیدن:** *[کنایی]* میراتی کەر بە کەمتیار گەیشتن؛ شتێ لە مرۆڤێکی خراپەوە بگاتە یەکێکی خراپتر. (بە کوردی دەڵێن: میرات کەر هی کەمتیارە).

**ارث گذاشتن:** میراتی بە جێ هێشتن ‹یک خانه ارث گذاشت: ماڵێکی میراتی بە جێ هێشت›.

**ارثاً** / ersan'/: [عربی] *قید*. بە میراتی؛ بە

کەلەپووری.

**ارثخـور** / 'ersxor'، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] صفت. [گفتاری] میراتبەر؛ ئیرسبەر.

**ارثومیـراث** / 'ers-o-mîrās'، ـهـا/: [عربـی] اسـم. [گفتـاری] ئێـرس و مـیراس؛ مـردەلا؛ مەردەلا.

**ارثی** / 'ersî/: [عربی] صفت. ئەوەی لە باب و دایکـەوە (وەک بـیچم و ڕەنگـی چـاو و...) بـە مندالان دەبڕێ.

**ارثیه** / 'ersîyye'، ـها/: [عربی] اسم. کـەلـەپـوور؛ شتێ کـە لـە کـەسـێکەوە، بـۆ پاشمـاوەکـانی دەمێنێتەوە.

▣ **ارثیەی پدری:** بابێنی؛ بـەشـی بـاوکی؛ مـاڵ و سامانی باوکی؛ میراتی باوک.

**ارج** / 'arc/: اسم. پیـز؛ هێـژ؛ نـرخ؛ بـەهـا؛ بایـەخ؛ هرمـەت؛ حورمـەت؛ ڕێـز؛ سـەنـگ و ڕەنـگ؛ ئـەرزش؛ ئـەرجـست؛ ئـەرزشـت؛ گەورەیـی (زیـاتر لـە بـاری چۆنیـەتیـەوەیـە نـەک چەندیەتی).

▣ **ارج گذاشتن:** نرخ دانان؛ گەورەیی دانان.

**ارج نهادن:** نرخ بۆ دانان.

**ارج ننهادن:** لـووت پێـدا نـەهێنـان؛ لـێ ڕازی نـەبـوون؛ نـرخ نـەدان بـە کـەسـێ؛ خێ(هەمیەت) نەدان بە کەسێ.

**ارجـاع** / 'ercā''، ـهـا؛ ـات/: [عربـی] اسـم. ناردنەوە: ۱. کـار یـان ڕەوتی پێـدانی کـارێ لـە کـەسـێ یـان شوێنێکـەوە بـۆ کـەسـێک یـان شـوێنێکی تـر ۲. ڕەوتی پێـدانی ڕاڤـە یـان ڕاپۆرتی بابەتێـک بـە شـوێنێکی تـر. هـەروەهـا:

**ارجاع دادن؛ ارجاع کردن**

**ارجاعـات** / 'ercā'āt/: [عربـی] ۱. جمـعِ ☜ ارجاع ۲. جمعِ ☜ ارجاعی

**ارجـاعی** / 'ercā'î'، ـها؛ ارجاعـات/: [عربـی] اسـم. هەڵگەڕاوە؛ ئەوەی گەڕاوەتەوە.

**ارجـح** / 'arcah/: [عربـی] صفت. ۱. سـەرتـر ۲. چاتر؛ باشتر ۳. شایانتر؛ شیاوتر؛ پەسەندتر.

**ارجحیـت** / 'arcahîyyat'، ـهـا/: [عربـی] اسـم. ۱. سـەرتـری؛ هـەڤـیازی ۲. باشـتری ۳. شیاوتری.

**ارجمنـد** / 'arc(o)mand/: صـفت. هێـژا: ۱. خـۆشـەویـست؛ وەشـەویـست ۲. بـەوەج؛ ڕێـزدار؛ مـەزن؛ گـەورە؛ بـەڕێـز؛ زۆر بـەرز لـە باری دەروونیەوە.

**ارجن** / 'arcan/ ☜ بادام کوهی، **بادام**

**ارجوقـرب** / 'arc-o-qorb/: [فارسـی/ عربـی] اسـم. [گفتـاری] ڕێـز و قـەدر؛ ڕێـز و خۆشەویستی.

**ارجومقـام** / 'arc-o-maqām/: [عربـی/ فارسـی] اسم. شان و شکۆ؛ ڕێز و پێـز؛ پایـە و ڕێـز؛ پلـە و پایە.

**ارحـمالـراحمین** / 'arhamarrāhemîn/: [عربـی] صفت. دلۆڤـانترینی دلۆڤـانان ‹خداونـد ارحمالراحمین است: خوا دلۆڤانترینی دلۆڤانانە›.

**ارخـالق** / 'arxāloq'، ـهـا/: [ترکـی] اسـم. [قدیمی] سوخمە؛ ئەخلەخ؛ جلی ژێرکەوا.

**ارد** / 'ord'، ـهـا/: [از فرانـسوی] اسـم. فرمـان؛ دەسـوور؛ فرمانێـک کـە لـە چێـشتخانە و ڕسـتۆراندا بـە بـەردەسـت دەدرێ بـۆ جێبەجێ کردنی داواکاریگەل.

▣ **ارد دادن:** ۱. فرمـان دان ‹حـالا هـی اُرد بـده: ئێـسە هـەر فرمـان بـدە› ۲. [کنـایی] دەسـووردان؛ بـە ناحـەقـەوە ئـەنجـامدانی کارێ لە کـەسـێک ویـستن ‹چقدر اُرد مـی‌داد: چەندە دەسووری دەدا›.

**ارد کـسی را خوانـدن:** ملـدان بـە دەسـووری کەسێک.

**اردک** / 'ordak'، ـهـا/: [ترکـی] اسـم. ۱. سۆنە؛ سۆنێ؛ بتئـاوی؛ شـووش؛ پـەلـەوەری ئاوبـاز و کـەوی و بـێپـەرواز لـە تـیرەی مـراوی، بـە پـا و ملـی کـورت و خرپنـەوە ۲.

مراوی؛ مراویە؛ مەلی کۆچەری پێکەوەژی سۆنەئاسا.

**اردنانس** / ordonāns'/: [فرانسوی]/اسم. *[نظامی]* ئوردونانس؛ ئابوور کردنی چەک و تەقەمەنی.

**اردنگ** / ordang'/ ☜ **اردنگی**

**اردنگی** / ordangî'، ـها/:/اسم. *[گفتاری]* دەخش؛ شەق؛ بلتە؛ ئۆردەنگی؛ شەق وەشاندنی بە ئەژنۆ. هەروەها: **اردنگی پراندن؛ اردنگی خوردن؛ اردنگی زدن**

▣ **با اردنگی بیرون کردن:** *[کنایی]* بەشەق دەرکردن؛ بە سووکی وە دەرنان.

**اردو** / ordû'/: [ترکی]/اسم. ۱. /ـها/ هۆردوو؛ دەستەیەک کە لە هۆردووگایەکدا گیرساونەتەوە ۲. /ـها/ هۆردووگە؛ هۆردوو ‹رفته بودیم اردو: چووبووینە هوردووگە› ۳. /ـها/ *[قدیمی]* لەشکر؛ سپا ٤. هووڕەو؛ ئاپۆرە؛ خەڵکێکی زۆر ٥. زمانی ئوردوو؛ زمانێک لە بنەماڵەی زوانگەلی هیندو ئێرانی کە لە پاکستان، ئەفغانستان و هێند، بەشێ لە خەڵکەکە قسەی پێ دەکەن.

▣ **اردو زدن:** لەشکر بەز کردن؛ نیشتەجێ بوونی هۆردوو لە جێگایەکدا.

**اردوال** / ardavāl'، ـها/: [؟]/اسم. شیست؛ جۆرێ بەرد.

**اردور** / ordovr'/: [فرانسوی] ☜ **پیش‌غذا**

**اردوکشی** / ordûkešî'، ـها/: [ترکی/فارسی] اسم. *[قدیمی]* لەشکرکێشی.

**اردوگاه** / ordûgāh'، ـها/: [ترکی/فارسی] اسم. هوردووگا؛ ئۆردووگا: ۱. مەکۆیەک کە تاقمێکی تێدا بۆ تاوێک و بە شێوەی کۆ نیشتەجێ دەبن ‹اردوگاه دانش‌آموزی: ئۆردووگای خوێندکاری› ۲. دامەزراوەیەک وەک بڕێ ڕەشماڵ، خانووچکەی پێش‌سازراو و... بۆ دانیشتنی زۆرەکی و بەکۆمەڵی گرۆیێک ‹اردوگاه پناهندگان: ئوردووگای پەنابەران›.

**اردوویسین** / ordovîs(i)yan'/: [فرانسوی] /اسم. ئوردوویسیەن؛ دەوری دووهەم لە دەورانی یەکەمی زەوی‌ناسی: **اردویسین**

**ارده** / arde'/:/اسم. ئەردە؛ کرەکونجی؛ کونجی هاڕدراو؛ کونجی هاڕەکراو؛ کەڵدڕی هاڕیاگ.

**اردەشیره** / ardešîre'/:/اسم. ئاردەشیرە؛ ئاردەقوم؛ هەڵوائاردە.

**اردیبهشت** / ordîbehešt'/:/اسم. گوڵان؛ بانەمەڕ؛ جووەدرەو؛ مانگی تێرەخوەرە؛ دووهەم مانگی بەهار؛ مانگی دووهەمی ساڵی هەتاوی ئێران کە ۳۱ ڕۆژە.

**ارز** / arz'، ـها/:/اسم. پارەی بیانی؛ پارەی وڵاتانی‌تر جگە لە وڵاتی خۆ.

**ارزاق** / arzāq'/: [عربی]/اسم. ۱. جمع ☜ **رِزْق** ۲. خاروبار.

**ارزان**[1] / arzān'/: *صفت.* ئەرزان؛ هەرزان؛ کەم‌نرخ؛ مەلاخۆر؛ مەلاخۆرە؛ کەم‌قیمەت: ۱. شتێ کە نرخی کەمتر لە ڕادەی ئاسایی یان پێشووی بێ ‹نان ارزان شده: نان هەرزان بووە› ۲. بە نرخی شیاو و بە جێ ‹آنجا کتاب ارزان است: دەوێدا کتێب هەرزانە›. هەروەها: **ارزان بودن؛ ارزان شدن؛ ارزان کردن**

**ارزان**[2]: *قید.* هەرزان؛ بە شێوەی هەرزان؛ بە نرخی هەرزان ‹آنجا کتاب را ارزان می‌فروشند: دەوێدا کتێب هەرزان دەفرۆشن›. هەروەها: **ارزان خریدن؛ ارزان فروختن**

**ارزانفروش** / arzānfurûš'، ـها/: *صفت.* هەرزانجان؛ کەسێ کە ئاکار و خدەی بەرەو لای هەرزانجانی هەبێت.

**ارزانفروشی** / arzānfurûšî'/:/اسم. هەرزانجانی؛ کار یان ڕەوتی فرۆتنی شت‌ومەک بە نرخی باش یان هەرزانتر لە

فرۆشەرەکانی تر.

**ارزان‌قیمت** / 'arzānqeymat, -qîmat/: [فارسی/ عربی] *صفت*. هەرزان؛ هەرزان‌بایی؛ نرخ هەرزان؛ بە نرخێکی کەمتر لە بەرانبەر پیتەوای هاوچەشنەوە.

**ارزانی** [1] / 'arzānî/: [عربی]/*سم*. ۱. هەرزانی؛ گوشادی؛ پێشکەشی؛ شوولگ؛ شت‌زۆری ‹ارزانی نان گذشت و ارزانی جان شد: دەوری نان هەرزانی چوو، ئێستەکە گیان هەرزانە› ۲. فەرحانی؛ فرەهی؛ بژیو زۆری ‹در گذشته ارزانی بود و مردم زندگی راحتی داشتند: لە رابردوودا فەرحانی بوو و خەلک ژیانێکی باشیان هەبوو›.

**ارزانی** [2]: *صفت*. خەلات؛ شیاو؛ ڕەوا (بە هێماوە) خەلاتی؛ پێشکەشی ‹این خانه جای من نیست ارزانی خودت: ئەم مالە جێی من نییە خەلاتی خۆت›.

▣ **ارزانی داشتن/کردن**: بەخشین؛ بەشینەوە ‹خداوند به من یک پسر ارزانی داشت: خوا کوڕێکی پێ بەخشیم›.

**ارزش** / 'arzeš ، ـها/: *اسم*. ۱. *[اقتصاد]* نرخ؛ بایی ‹ارزش این خانه چقدر است؟: ئەم مالە بایی چەندە؟› ۲. بایەخ ‹نزد خردمند، جهان بی‌ارزش است: لای تێگەیشتوو جیهان بێ‌بایەخە› ۳. بایەخ ‹کار با ارزش: کاری بە بایەخ› ٤. *[جامعه‌شناسی]* بایەخ؛ پێوانەگەلی فەرهەنگی هاوبەش لە کۆمەلگایەکدا (وەک: کار، ئازادی، هونەر، ڕاستی و...) ‹آزادی یک ارزش است: ئازادی بایەخێکە›.

▣ **ارزش پول**: بایەخی پارە؛ ڕادەی قەوەت و بایەخی پارەیەک بۆ کڕینی هەر شتێ لە بازاڕدا.

**ارزشهای اخلاقی**: بایەخگەلی ئاکاری؛ بایەخگەلی ئەخلاقی؛ شێوەگەلی ئاکاری پەسندکراو لە لایەن پرایی ئەندامگەلی کۆمەل یان دەستەیەکەوە.

▣ **ارزش داشتن**: هێژا بوون؛ بایەخدار بوون؛ تیەرزین.

**ارزش قایل شدن**: بایەخ پێدان؛ ڕێز لێگرتن؛ نرخ بۆ دانان.

**ارزش‌شناسی** / 'arzeš.šenāsî/: *اسم*. بایەخ‌ناسی؛ هێژایی‌ناسی؛ لقێک لە زانست سەبارەت بە لێکۆلینەوەی چیەتی، چەشن و پێومانی بایەخگەل و داوەری لە مەڕ ئەوانەوە، بە تایبەت لە زانستی ئەخلاقدا.

**ارزشگذاری** / 'arzešgozārî، ـها/: *اسم*. نرخ‌بڕی؛ کار یان ڕەوتی نرخاندن؛ نرخ بۆ دانان؛ هێژاندن؛ قرساندن؛ نرخ بۆ بڕینی شتێک بە پێی داوەری زەینی.

**ارزشمند** / 'arzešmand/: *صفت*. هێژا؛ بەنرخ؛ هەژی؛ کوک؛ حەلکی؛ باییدار؛ نرخدار؛ هاولە؛ کاو؛ بایەخدار؛ بەبایەخ ‹کتاب ارزشمند: کتێبی هێژا›.

**ارزشمندی** / 'arzešmandî/: اسم. هێژایی؛ بەنرخی.

**ارزشیابی** / 'arzešyābî، ـها/: *اسم*. نرخ‌بڕی؛ کار یان ڕەوتی دیاری‌کردنی بایەخی شتێک، بەتایبەت بەلگەیەک، پتر بە گوێرەی پێومانگەلی لە پێش دیاریکراو.

**ارزن** / 'arzan، ـها/: *اسم*. هەرزن؛ هەرزین؛ هەرزنێ؛ ئەرزن؛ کارس؛ باچیک؛ کۆرەک؛ کورێک؛ گاریس؛ گەلدوو؛ ڕەمەرانە؛ سۆزک؛ سوورکە؛ گال؛ گیەل؛ گەنمە شامیە سوورە؛ زراتە کێویلە؛ ڕووەکێک لە بنەمالەی گەنم کە دانەکانی ورد و سافە و بە تایبەت پەلەوەران دەیخۆن.

▣ **ارزن تلخ**: گال؛ هەرزنەتالە؛ جۆرێ هەرزن کە چێژەی تالە.

**ارزن خوشه‌ای**: زوڕات؛ هەرزنە گەورە؛ زورەت؛ گەنمەشامی.

**ارزن درشت:** کزن؛ گارس؛ هەرزنە گەورە.

**ارزن کوهی:** هەرزنەکێویلە؛ گیایەکە بەرێکی وەک هەرزن دەگرێ.

**ارزنی از خرمنی:** *[کنایی]* مشتێ لە دەشتێ؛ دڵۆپێ لە ڕووبارێ؛ گوڵێ لە گوڵزارێ؛ گەرەکێ لە شارێ.

**به قدر ارزنی:** *[کنایی]* ئەوەندەی نیسکێک؛ فرە بچووک و کەم؛ ئینە و مرۆچێوی؛ وەقەی باڵەمێشێک.

▣ **ارزن از لای انگشت کسی نریختن:** *[کنایی]* هیچ لە کەسێ هەڵنەوەرین؛ زۆر ڕژد و چرووک بوون؛ وشکەهەوەڕ بیەی.

**ارزن روی چیزی پهن کردن:** *[کنایی]* مەویژ لە سەر ڕەشکە هەڵخستن؛ بڕ و بیانوو هێنان بۆ نەدانی شتێک.

**ارزنده** / arzande'/: *صفت.* هێژا؛ نایاب؛ زۆر بەنرخ ‹خدمت ارزنده؛ کتاب ارزنده: خزمەتی زور بەنرخ؛ کتێبی نایاب›.

**ارزی** / arzî'/: *صفت.* سەر بە پارەی بیانی.

**ارزیاب** / arzyāb'، ـها؛ ـان/: *اسم.* نرخبڕ؛ نرخێنەر؛ هەڵسەنگێنەر؛ خەملێنەر؛ نرخدانەر؛ قەرسێنەر؛ نەهێنەر؛ بەراوردکار؛ هێژانکار؛ کەسێ کە نرخی شتان دیاری دەکا.

**ارزیابی** / arzyābî'، ـها/: *اسم.* هەڵسەنگێنی؛ بەراورد؛ ئەزمون؛ سەنگالی؛ سەنگاتی؛ قەبلی؛ خەمڵ؛ خەملێنەری؛ قەرسێنەری؛ نەهێنەری: ۱. کار یان ڕەوتی هەڵسەنگاندن؛ دیاریکردنی بایەخی شتێک ‹هنر را نمی‌توان با معیارهای مادی ارزیابی کرد: ناکرێ هونەر بە پێومانگەلی مادی هەڵسەنگێنریت› ۲. تۆژینەوەی قازانج و زەرەر یان خاسی و خراوی کارێ ‹ارزیابی کار مدیران: بەراوردی کاری بەڕێوەبەران› ۳. بەراوردی نرخ ‹ارزیابی مالی شرکت: سەنگاندنی مالی شەریکە›.

▣ **ارزیابی شده:** قەبلاو؛ خەمڵ کراو؛ قرساو؛ بەراوردکراو.

▣ **ارزیابی شدن:** قەبلین؛ هەسبان؛ نەهان؛ خەملان؛ قەرسان؛ نرخ لەسەر دانران.

**ارزیابی کردن:** خەمڵ کردن؛ نەهاندن؛ خەملاندن؛ بەراوردکردن؛ قەرساندن؛ قرساندن؛ هەڵسەنگاندن؛ هەڵسەنگانن؛ سەنگاندن؛ قەولانن؛ قەبلاندن؛ هێژاندن؛ نرخبڕین؛ نرخاندن؛ هەسباندن؛ گومان بردن؛ واتێگەیشتن؛ کرێشەیش؛ دەرهێنانی نرخی شتێ.

**ارزیافت** / arzyāft'/: *اسم.* گوزارشت یان ئاکامی هەڵسەنگاندن.

**ارزیدن** / arzîdan'/: *مصدر لازم.* // **ارزیدی:** ژیای؛ **میارزی:** دەژی؛ **بیرز:** بژی// هێژان؛ هەژیان؛ هێنان؛ ئێژەی؛ ئێژای؛ ژیان؛ ژان؛ هەرزین؛ نرخ هێنان: ۱. بایەخدار بوون ۲. شیاو بوون. هەروەها: **ارزیدنی**

■ صفت فاعلی: **ارزنده** (هێژا)/ صفت مفعولی: **ارزیده** (هێژاو)/ مصدر منفی: **نَیَرزیدن** (نەهێژان)

**ارزیز** / arzîz'/: *اسم.* قالایی؛ قەلایی؛ ژرێژ؛ مز؛ کانزایەکی نەرمی سپیە، مسی پێ سپی دەکەنەوە.

**ارژن** / arjan'/ ☜ بادام کوهی، **بادام**

**ارس** / ors'، ـها/: *اسم.* سەندەلووس؛ ناوی چەند جۆر سەڵوی کێویە.

**ارسال** / ersāl'/: [عربی]/*اسم.* کل؛ کار یان ڕەوتی ناردن؛ هەناردن؛ بەڕێ کردن؛ ڕەوانە کردن؛ کیاسەی؛ کیاستەی.

▣ **ارسال رادیویی:** ناردنی ڕادیۆیی؛ ناردنی پەیام لە ڕێگەی بێسیمەوە.

**ارسال مَثَل:** *[بدیع]* تێهەڵکێشانی پەندێکی بەناوبانگ یان وتەیەکی جوان و

قوول له هه‌ڵبه‌ستدا.

**ارسال مراسلات**: ناردنی نامه‌گه‌ل.

⊡ **ارسال شدن**: ناردران؛ به‌ڕێوه کران؛ کیاسیه‌ی. هه‌روه‌ها: **ارسال کردن**

**ارسال داشتن**: ناردن؛ هه‌ناردن؛ کل کردن؛ به‌ڕێ کردن.

**ارسالی** / ersālî'/: [عربی] *صفت*. ناردراو؛ ڕه‌وانه‌کراو؛ هه‌ناردوو؛ به‌ڕێکراو؛ هه‌ناردی؛ ناریاگ؛ کیاسیا.

**ارسنیک** / arsenîk'/: [فرانسوی] */اسم*. ئارسێنیک؛ توخمێکی کیمیایی ناکانزایه به ژماره‌ی ئه‌تومی ۳۳ و کێشی ئه‌تومی ۷٤٫۹۲، به ڕواڵه‌ت له کانزا ده‌کا و ڕه‌نگی بۆره: **آرسنیک**

⊡ **ارسنیک سفید**: ئارسنیکی سپی؛ ده‌رمانی مشک.

**ارسی** / or(o)sî'، ـها/: [روسی] */اسم. [قدیمی]* ۱. عورووسی؛ ئورووسی؛ ڕه‌وانی؛ جۆرێ په‌نجه‌ره‌ی چێوی به شیشه‌ی ڕه‌نگاوڕه‌نگ و چکۆله‌وه، که هه‌ڵده‌درێته‌وه ۲. که‌وش، به‌تایبه‌ت که‌وشی چه‌رمی پاژنه‌دار و قه‌یتانی.

**ارسی‌دوز** / or(o)sîdûz'، ـها/: [روسی/ فارسی] */اسم. [قدیمی]* که‌وشدوور؛ که‌وشدروو؛ که‌وشدۆز؛ پالاوراز.

**ارش** / araš'/: */اسم*. ئانیشک؛ له سه‌ر قامکه بالابه‌رزه‌وه تا بن ئێسک که یه‌که‌یێکی درێژایی پێوان بووه له ڕابوردوودا و به‌رامبه‌ر به دوو بست یان نیوگه‌زه: **رَش**

**ارشاد** / eršād'، ـها؛ ـات/: [عربی] */اسم*. ڕێنوێنی؛ ڕێشانده‌ری؛ ڕێنمایی؛ ڕێبه‌رنان؛ ڕێنمانی به‌تایبه‌ت له بواری ئه‌خلاقی، کرده‌وه یان دینیه‌وه.

⊡ **ارشاد شدن**: ڕێشاندران؛ ڕێنوێنی‌کران؛ ڕێبه‌رنران. هه‌روه‌ها: **ارشاد کردن**

**ارشادکننده** / eršādkonande'، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *صفت*. ڕێشانده‌ر؛ ڕێ‌پیشانده‌ر؛ ڕێنما. هه‌روه‌ها: **ارشادکنندگی**

**ارشادی** / eršādî'/: [عربی] *صفت*. ڕێشانده‌ری؛ ڕێنوێنی.

**ارشد** / aršad'/: [عربی] *صفت*. ۱. گه‌وره؛ گه‌وره‌تر ‹فرزند ارشد: منالی گه‌وره› ۲. بالاده‌س؛ سه‌روو ‹درجه ارشد: پله‌ی سه‌روو›.

**ارشدیت** / aršadîyyat'/: [عربی] */اسم*. هه‌ڤیازی؛ بالاده‌ستی؛ سه‌ری؛ بار و دۆخی بالاده‌ست بوون.

**ارصاد** / ersād'/: [عربی] */اسم*. ئاسمان‌دۆزی؛ کار یان ڕه‌وتی ڕوانین بۆ ئاسمان.

**ارض** / arz'، اراضی/: [عربی] */اسم*. ۱. زه‌وین؛ زه‌وی؛ زه‌مین؛ ئه‌رز؛ هه‌رد؛ بوومی ۲. سه‌رزه‌وین؛ وڵات؛ مه‌ڵبه‌ند؛ هه‌رد و بووم.

**ارضا** / erzā'/: [عربی] */اسم*. دامه‌زراوی؛ دڵنیایی؛ کار یان ڕه‌وتی ڕازی‌کردن.

⊡ **ارضا شدن**: ۱. ڕه‌حه‌ت بوون؛ ڕازی بوون؛ دڵخۆش بوون؛ دابین بوون (یان به‌دیهاتنی) خواست و ئاره‌زوو ۲. *[کنایی]* ئاوهاتنه‌وه؛ کاژێر بوون (بۆ پیاو)؛ زاوێر بوون (بۆ ژن)؛ ڕه‌حه‌ت بوونی ژن یان پیاو له‌باری جینسیه‌وه. هه‌روه‌ها: **ارضا کردن**

**ارضی** / arzî'/: [عربی] *صفت*. زه‌وینی؛ هه‌ردی؛ ئه‌رزی؛ پێوه‌ندیدار یان سه‌ر به زه‌وین.

**ارعاب** / er'āb'، ـها/: [عربی] */اسم*. کاری تۆقاندن؛ ترساندن؛ زراو بردن؛ زاڵه‌ تره‌کاندن؛ هه‌ژڤاندن؛ هه‌ڕه‌شه و گوڕه‌شه لێکردن. هه‌روه‌ها: **ارعاب و تهدید؛ دست به ارعاب زدن**

**ارغنون** / arqanûn'، ـها/: [معرب از یونانی] */اسم*. ئه‌رغه‌نوون؛ چه‌شنێک ئۆرگی ده‌ستی کۆن (ئامرازی مووسیقا).

**ارغــــوان** / arqavān'/:/اسـم. ئــەرخـــەوان؛ ئـــەرغـــەوان: ١. /ــهــا/ دار ئــەرخـــەوان؛ دارئـەرغـوو؛ دارێکـە گوڵـە هـەلالـەی سـووری ئامـاڵ بـەنـەوش دەکـا و پـاش چـرۆ گـەلا دەردەکـات ٢. /ـهـا/ گوڵـەئـەرغـوو؛ گوڵـی ئەرخەوان؛ گوڵی ئەو دارە.

**ارغـــوانی** [1] / arqavānî'/:/اسـم. ئـەرخـەوانی؛ ڕەنگی ئەرخـەوان؛ ڕەنگـی سـووری بریقـەداری ئاماڵ بەنەوش.

**ارغــوانی** [2]: صـفت. ئـەرخـەوانی؛ بـە ڕەنگـی ئەرخەوان.

**ارغه** / arqe'/ ☜ **آرقه**

**ارفــاق** / erfāq'، ــهـا؛ ـات/: [عربـی]/اسـم. پێبەخشیان؛ چاوپۆشـی یـان یاریـدەیـەک کـە بـڕێک زیـاتر لـە هـەقـی خـۆی بـێ ‹اگـر معلم ارفاق نکرده بـود، قبـول نمـی‌شـدم: ئـەگـەر مامۆسـتا پێی نەدەبەخشیم سەر نەدەکەوتم›.

**ارفاقـــــاً** / erfāqan'/: [عربـــــی] قیـــــد. بەپێبەخشینەوە؛ لە ڕووی چاوپۆشیەوە.

**ارقام** / arqām'/: [عربی] جمعِ ☜ **رقَم**

**ارقـــم** / arqam'/: [عربـــی] جنجێـــر؛ جـــنجیر؛ ماری دوو ڕەنگ؛ ماری خاڵدار.

**ارقــه** / arqe'، ــهـا/: صـفت. [گفتـاری] زرک و گزیکار؛ دەبـەکـار؛ تـەشـقەلـەبـاز؛ فێـڵباز؛ (بـە هێما) سەگ؛ حەرامزا: **ارغه**

**ارک** / ark'/ ☜ **آرگ**

**ارکان** / arkān'/: [عربی] جمعِ ☜ **رُکن**

▣ **ارکــان اربعــه:** چـــوار سروشـــت؛ چـــوار دیرەگی سروشت (ئاو، ئاگر، خاک، با).

**ارکـان حـرب:** [قـدیمی] هیمـەکـانی شـەڕ؛ لێژنـــەی لـــەشـــکەر؛ لێژنـــەی ســـپا؛ کۆڵەکەکانی شەڕ.

**ارکان دولت:** هیمـەکـانی دەوڵـەت؛ سـەران و سەرگەورەگـەلی دەوڵـەت؛ کۆڵـەکـەکـانی دەوڵەت.

**ارکان نماز:** کۆڵەکـەکـانی نـوێژ؛ هیمـەکـانی نوێژ (تەکبیرەتـولئیحـرام، وەسـتان، دانـەویـن و چوونە سوژدە).

**ارکاندیــــــشن** / e(y)rkāndîšen'، ــهـــا/: [انگلیـــسی]/اســـم. بـــاگۆڕی؛ هـــەواگـــۆڕی؛ سیستەمێکە لە هێنـدێ مـاڵ و ماشـیندا، هـەوا دەگۆڕێ و سارد یان گەرمی دەکاتەوە.

**ارکــستر** / orkes(t)r'، ــهـا/: [فرانـسوی]/اسـم. ئۆرکێستر؛ سازبەند؛ ڕستەی مۆسیقا ژەنان.

▣ **ارکـــــستر ســـــمفنیک:** ئۆرکێـــــستری سەمفونێک؛ سـازبەنـدێکی مـەزن بـریتی لـە چەندین ژەنیار بۆ هەرسازێک.

**ارکـــستر فیلارمونیـــک:** ئۆرکێـــستری فیلارموونیـک؛ گرووپـی ژەنیـاری سـەر بـە ئەنجومەنی فیلارموونیک.

**ارکـــستر مجلـــسی:** ئۆرکێـــستری کـــۆڕی؛ ســازبەنــدێک کــە ژمــارەی ژەنیــارەکــانی کەمتر لە دەکەسە.

**ارکــــــــــستراسیون** / orkestrās(i)yon'/: [فرانـــسوی]/اســـم. ئـــورکێـــستراسیۆن: ١. ســازبەنــدی و تــەکــووزکردنی ئاهــەنگێــک بــۆ کـــاری هاوکـــاتی چـــەنـــدین ســـاز یـــان ئۆرکێـــسترێک ٢. هونــــەری ســـازکردنی ئاهەنگ بۆ ئۆرکێستر.

**ارکیــده** / orkîde'، ــهـا/: [فرانـسوی]/اسـم. ئورکیـدە؛ گوڵـێکی سـپی یـان چێـرەیـی زۆر جوانە و لە گوڵخانەدا باریدێنن.

**ارگ** / arg'، ــهـا/:/اسم. [قـدیمی] قـەلا؛ دژ؛ دز؛ کەل؛ کەلێ: ١. قـەلاتـێ کـە لـە نێـو شـاردایە ٢. بنکـــەی چـــەکـــداری؛ پاســـگە؛ شـــوێنی هەلـگرتن و پاراسـتنی چـەک و تـەقـەمـەنی * **ارک**

**ارگ** / erg'، ــهـا/:/اسم. [فیزیـک] یەکـەی کـار یـان هێـز، بەرامبـەر بـە کارێـک کـە هێـزی یـــەک دیـــن(Dîn) لـــە گۆزاندنەوەیـــەک بـــە

ئەندازەی یەک سانتیمیتردا دەیکا.

**ارگ** / org'، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ئـورگ؛ سـازێکی گـەورە بـە چـەن ڕیـز دوگمـەی دەسـتی و ڕیزێـک دوگمـەی پـایی، بـۆ دەرهێنانی چەند دەنگ پێکەوە.

▣ **ارگ دستی:** ئـۆرگی دەسـتی؛ ئـۆرگی وا کـە هـەڵـبگیردرێ و ئـەملا و ئـەولای پـێ بکرێ.

**ارگـان** / orgān'، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ۱. */زیستشناسی/* ئەندام؛ ئەنام؛ بەشێک لـە لـەش بە کاری تایبەتەوە ۲. ئورگان؛ گوتـەبێژی بیر و بۆچوونگـەلی ڕێکخـراوە یـان دەسـتەیێـک ۳. بنکەی کۆمەلایەتی.

**ارگـانیزه** / orgānîze'/: [فرانسوی] صفت. ڕێخـراوە؛ ڕێکخـراوە؛ سـامانپێـدراو؛ ڕێکوپێک کراو.

**ارگانیسم** / orgānîsm'، ـها/: [فرانسوی]/اسم. زیندەوەر؛ ژینەوەر.

**ارگانیـک** / orgānîk'/: [فرانسوی] صفت. ۱. ئـالی؛ ژینـەوەری؛ سـەر بـە زینـدەوەر ۲. ئەندامی؛ ئەنامی؛ سەربەئەندام؛ زیندەڵ.

**ارگونـومی** / ergonomî'/: [فرانسوی]/اسم. ئێرگۆنـۆمی؛ زانـستێک کـە بـە چاوبـڕین و کەڵـک وەرگـرتن لـە ڕەوتـە زینـدەوەریـەکان، تێـدەکۆشـێ ئـامراز و کـەرەسـتەی باشـتر و بەکەڵکتر دروست بکا.

**ارل** / erl'، ـها/: [عربی]/اسم. ئێـرل؛ نازنـاوی چینێک لە پیاو ماقوولانی ئینگلیز.

**ارم** / eram'/: [عربی]/اسم. */ادبی/* ۱. بـەهـەشـت؛ بـەهـەشـت ۲. ئێـرەم؛ باغێـک لـە بەهەشتدا ‹باغ ارم: باغی ئیرەم›.

**ارمغـان** / armaqān'، ـها/: [ترکی]/اسم. */ادبی/* دیـاری؛ سـەوقـات؛ سـەوقـاتی؛ سـلامانە؛ دەسـاوێز؛ دەسـتاوێز؛ پێـشکێش؛ پێـشکەشـی؛ دیـاری سـەفـەر ‹سـیبزمینـی، توتـون و گوجـەفرنگـی، ارمغـان دنیـای جدیـد اسـت: سێفەزەمینی، تـووتن و تـەماتـە، دیـاری دنیـای نوێیە›. هەروەها: **ارمغان آوردن**

▣ **ارمغان مور:** */مجازی/* دیـاری شـوان؛ دیـاری کەم و بچووک.

**ارمنـی** / armanî'/:/اسم. هـەرمـەنی؛ ئـەرمـەنی؛ ئـارانی: ۱. هۆزێـک لـە ڕەگـەزی ئاریـایی، دانیـشتووی هـەرمـەنـستان ۲./ـها؛ ـان؛ ارامنە/ هەرکام لە کـەسگەلی ئـەو هـۆزە ۳. یـەکـێ لـە زمانگـەلی هینـدو ئورووپـایی کـە ئەرمەنیگەل قسەی پێ دەکەن.

**ارمـوی** / ormavî' ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. */ادبی/* ورمێیی: ۱. خەڵـکی ورمـێ ۲. سـەر بـە شاری ورمێ لە باکووری ڕۆژاوای ئێران.

**ارنب** / arnab'/: [عربی] ☜ **خرگوش ــ۱**

**ارنعـوت** / arna'ût'، ـها/: [ترکی]/اسم. */گفتاری/* زلحۆرت؛ زلحۆ؛ زلـک؛ تـەژە؛ ترتـەمـان؛ بـەلان؛ بڕبانە؛ حندرحۆ؛ قۆلـەمـە؛ زڕ و زەلام؛ گـەبـەزە؛ مرۆی لەش درشتی نەفام.

**ارنه** / arna'/: حرف. ئـەگـەرنـا؛ ئـەگینـا؛ دەنـا؛ ئەرنا؛ هەگەنا؛ وەرنا.

**ارواح** / arvāh'/: [عربی]/اسم. ۱. جمـعِ ☜ **روح** ۲. */گفتاری/* گیـان: *الـف)* سـەر؛ ئـەرواح؛ ئـەروا؛ وشـەی سـوێند پـێخـواردن و سـوێندان ‹ارواح جـدت ایـن کـار را نکـن: تـو سەری بابت، ئـەم کـارە مـەکـە› *ب)* گیـان خـۆت؛ وشەی سووکایەتی ‹ارواح بابات! خیال کـردی بـە ایـن راحتـی اسـت؟: ئـەرێ گیـان باوکـت! وات ئەزانی هەربەم ڕەحەتیەسە؟›.

▣ **ارواح خَبیثه:** ئەرواحی دزێو.

**ارواح طَیِّبه:** ئەرواحی پاک.

**اروپائی** / urûpā'î'/: [لاتینی] ☜ **اروپایی**

**اروپـایی**[1] / urûpāyî, 'oûrpāyî'، ـها؛ ـان/: [لاتینی]/اسم. ئورووپایی؛ فەرەنگـی؛ هـەرکـام لـە خەڵکانی ئورووپـا یـان زارۆکانیـان ‹چنـد اروپـایی

دیروز اینجا بودند: چەند ئوورووپایی دوێکە لێرە بوون〉.

**اروپایی**[۲]: *صفت.* ئورووپایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە قورنەی ئورووپا 〈کشورهای اروپایی: وڵاتە ئورووپاییەکان〉.

**اروپیم** / urop(i)yom'/: [فرانسوی]/*اسم.* ئوروپیۆم؛ توخمێکی کیمیایی کانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان بە ژمارەی ئەتومی ٦٣ و کێشی ئەتومی ۱۵۱,۹٦.

**اره** / arre' ، ـها/: /*اسم.* هەرە؛ ئەرە؛ بڕە؛ بڕەک؛ ئەڕا؛ مشار؛ تیغی ددانەدار بۆ شت (بەتایبەت دار) بڕینەوە.

▣ **ارەی آهن‌بری:** هەرەی ئاسنبڕ؛ هەرەی ئاسنبڕی؛ مشاری ئاسنبڕی؛ بڕەکی ئاسن. هەروەها: **ارەی سنگ‌بری**

**ارەی برقی:** هەرە بەرقی؛ هەرەی کارەبایی؛ بڕەکی کارەبایی؛ مشاری‌کارەبایی؛ بڕەکێ کە بە وزەی کارەبا کار دەکا. هەروەها: **ارەی دستی**

**ارەی تَربَر:** هەرەی تەربڕ؛ مشاری تەربڕ؛ مشاری تایبەتی بۆ بڕینی داری تەڕ.

**ارەی درودگری:** مشار؛ هەرە؛ ئامرازی ددانەداری دار بڕینەوە.

**ارەی دوسر:** خزار؛ خیزار؛ شەقەمشار؛ شەقە؛ گروەبڕ؛ مشاری دووکەسی: **ارەی دونفره**

**ارەی دونفره** ☜ **ارەی دوسر**

**ارەی عمودی:** هەرەی ئەستوونی؛ مشاری ئەستوونی؛ مشارێ کە هێڵی بڕینەوەی لە سەردا بۆ خوارەوەیە.

**ارەی کمانی:** کەوان هەرە؛ هەرەی تایبەت بۆ بڕینەوە و دەرهێنانی ناوی شتێ.

**ارەی مویی:** هەرە مووی؛ هەرەی تایبەتی کاری زۆر ناسک و ورد.

**ارەی نواری:** هەرەی نەواری؛ بڕەیەک کە تیکەگەلی چوار گۆشە و گردی پێ دەبڕنەوە.

▣ **اره چاق کردن:** ۱. هەرە تیژکردنەوە؛ هەرە ساودان؛ ساوین و لە چەرخ دانی ددانەکانی هەرە ۲. *[کنایی]* هەڵخڕاندن و هەڵزرینگاندن بۆ ئاژاوە نانەوە.

**اره دادن و تیشه گرفتن:** *[مجازی]* شەڕە چەقە کردن؛ شەڕمە شەرعێ کردن؛ چەقە و هەرا کردن.

**اره کردن:** بە مشار بڕینەوە؛ داهێنان؛ هەرەکردن.

**ارەای** / arre'î'/: *صفت.* هەرەیی؛ مشاری؛ ئەڕەینە؛ هەرەئاسا؛ هەرشتێکی وەک هەرە.

**ارەقلمه** / arreqalame'/: [فارسی/ عربی] ☜ **تبریزی**[۱]

**ارەکش** / arrekeš'، ـها؛ ـان/: /*اسم.* شەقەکێش؛ هەرەکێش؛ دارتاش؛ کەسێ کە بە مشاری زل کار دەکا.

**ارەماهی** / arremāhî' ، ـها؛ ـان/: /*اسم.* هەرەماسی؛ هارەماسی؛ مشارە؛ جۆرێک ماسییە کە دەمی لە دوو ئێسکی وەک هەرە چێ بووە: **نیزەماهی**

**اریب** / orîb'/: *صفت.* چەفتوور؛ شەفت؛ شەفتوور؛ شەفتوول؛ چەفتول؛ دۆلکان؛ دۆلگان؛ خوارەکە و پێچەکە؛ خوارەوخوار؛ شەت؛ شەتوور؛ چەفتبڕیاگ؛ تیلاوتیل؛ لاولا؛ لاونیو؛ پێلە؛ لار؛ گێڕ؛ قەناس؛ ئورووف؛ کەش_تووش؛ کەش‌وتووش؛ لاترقەوچ؛ قیل‌قاج؛ قیلەوقاچ؛ قیرقاچ؛ قیلەوقانج.

**اریکه** / arîke'، ـها/: [معرب از فارسی؟]/*اسم.* *[ادبی]* تەخت؛ کورسی لەسەر دانیشتنی پاشا.

**اریگامی** / orîgāmî'/: [فرانسوی/ انگلیسی از ژاپنی] ☜ **کاغذوتا**

**اریـــــون** / or(i)yon'/: [فرانـــسوی]/اســـم. ملـەماسـیێ؛ ملـەخـڕە؛ ملـەخـڕێ؛ ئۆریـۆن؛ پەنەمیانی زلی لووی بن‌گوێ: **أوریۆن**

**از**[1] / az'/: [عربـی] حـرف. لـە؛ جـە؛ ژ؛ ئـەژ؛ ژێ: ۱. نە؛ نیـشانەی سـەرەتـایی ‹از سە سال پیش: لـە سـێ سـاڵ لـەمـەو پێـشەوە› ۲. نیـشانەی جووڵـە ‹از آن طـرف رفـت: لـەو لاوە چـوو› ۳. کـاری؛ بـەرهـەمـی؛ هـی؛ هینـوو ‹ایـن شعر از سعدی اسـت: ئـەم شـیعرە لـە سـەعدیـە› ٤. بـە هـۆی؛ بـە بۆنـەی ‹از او یـاد گـرفتم: لـە ئـەو فێـر بـووم› ٥. هـۆ؛ سـۆنگە ‹مـرگ از گرسـنگی: لـە برسـیەتیـدا مـردن› ٦. لـە بـەرامبـەر ‹از تـو نمـی‌ترسـم: لـە تـۆ ناترسـم› ۷. ئـەسـتۆ ‹از مـن کـاری برنمـی‌آیـد: کـارێ لـە دەسـتم نایـە› ۸. سـەبـارەت بـە؛ لـەمـەڕ ‹از کارهـایش مـی‌گفـت: باسـی لـە کـارەکانیـەوە دەکـرد› ۹. نیـشانەی هەموو یا بەشـێک ‹پر از دشمن: پڕ لـە دوژمـن› ۱۰. نیـشانەی بـەرامبـەرکردنـەوە ‹ایـن از آن بهتـر اسـت: ئـەم لـە ئـەو باشـترە› ۱۱. نـە؛ نیـشانەی سـەرچـاوە یـان بنـەمـا ‹از خـانوادەی بزرگـی اسـت: لـە بنـەماڵـەیـەکـی گـەورەیـە› ۱۲. نیـشانەی جیـاوازی ‹دسـت آن میمـون از پـایش درازتـر اسـت: دەسـتی ئـەو مـەیموونـە لـە پـای درێژتـرە› ۱۳. نیـشانەی جـنس ‹از آهـن سـاختە شدە: لە ئاسن دروست کراوە›.

**ازـ**[2]: پیشوند. لەـ ؛ جەـ ؛ ژـ ؛ ئەژـ ؛ ژەـ ؛ لـەتـەک ناوێـک و چاوگێکـدا، چـاوگێکی نـوێ دروسـت دەکـا کـە پتـر بـار و دۆخێـک پیـشان ئە دا ‹از پا افتـادن؛ از دسـت دادن: لـە پـێ کـەوتـن؛ ژدەسدان›.

**ازا** / ezā'/: [عربـــی] حـــرف. بــــەرامبـــــەر؛ بەرانبەری؛ وەراوەروو؛ هەمبەری؛ بارتەقای.

⊡ **بە/ در ازای**: لـە بـەرامبـەر؛ جـە وەراوەروو ‹در ازای هـــر دلار ۱۰۰۰ تومـــان گرفـــت: لـــە بـەرامبـەر هـەر دولارێکـەوە ۱۰۰۰ تمـەنی وەرگرت›.

**ازآب‌گذشـتـە** / azābgozašte'/ ـهـا/: صـفت. /فرهنـگ‌مـردم/ ۱. پـاک؛ خـاوێن؛ شـۆردراو (بـۆ خـۆراک) ۲. سـەوقـات؛ ئـەوەی کـە لـە شوێنێکی‌ترەوە هێنرابێ.

**ازار** / ezār'/ ـهـا/: [عربـی]/اسـم. /قـدیمی/ ۱. لۆنگ؛ فۆتە؛ قوماشـێک کـە لـە حـەمام بـەجێی دەرپـێ بـە دەور کـەمـەریانـدا دەبـەسـت ۲. پـاتۆڵ؛ پـانتۆڵ؛ ڕانـک؛ شـەل؛ شـواڵ ۳. شاشـیک؛ مێـزەر؛ مێـزەرە؛ مـشکی؛ جامانـە؛ سەروێـن ٤. چارشـێو؛ رووپـۆش؛ مـەلافـە یـان هـەر پۆشـەنێکـی‌تـر ٥. [فارسـی] ☜ **ازاره؛ هزاره**

⊡ **ازار بستن**: پاتۆڵ و دەرپێ لە پێ‌کردن.

**ازاره** / ezāre'/ ـهـا/: اسـم. پـادیوار؛ هیـزار؛ بەشی خواروی دیوار کـە بـە بـەرد، کـەرپووچ یـان کاشـی دەڕازێتـەوە و لـە بـەشـی‌تـری دیوارەکە جیا دەبێتەوە: **ازار؛ هزاره**

**ازالـە** / ezāle'/: [عربـی]/اسـم. کـار یـان ڕەوتی لابردن؛ نەهێلان؛ لە بـەیـن بـردن؛ نـەهێشتن؛ لەبن هێنان؛ دوورکردنەوە یان لە نێو بردن.

⊡ **ازالەی بکارت**: لابردنی کچێنی.

**ازالەی مو**: لابردنی موو؛ موو لابردن.

**ازالەی نجاسات**: لابـردنی پیـسی؛ نـەهـێلانی پیسی.

⊡ **ازالـە شـدن**: لـە بـەیـن چـوون؛ لاچـوون؛ نەمان؛ نەمەنەی. هەروەها: **ازاله کردن**

**ازالیـــد** / ozālîd'/: [فرانـسوی]/اسـم. /چـاپ/ ئوزالیـد؛ نـاوێکی بازرگانیـە بـۆ شـێوازێکی چاپ‌کـردنی خـەریتـە و دەسنووسـان بـە سـەر کاغەزەوە، بە هەڵمی ئاموونیاک: **أوزالید**

**ازآنـرو** / azānrû'/: حـرف. /ادبـی/ بـەو بۆنـەوە؛ بۆیە؛ لە بەر ئەوە؛ بەو هۆیـەوە؛ قـەینـاو ئانـەیـە؛ وەروو ئانەیە؛ ژبـەرکـوو ‹کوهی ریزش کـرده بـود، از انـرو قطـار چنـد سـاعت تـأخیر داشـت: کێوێـک

دارمابوو، بەو بۆنەوە شەمەندەفەرەکە چەند کاتژمێر وەدوا کەوت›.

**ازبــر** / azbar'/: *قید.* لەبەر؛ لبەر؛ لەسینە؛ دەرخ؛ ئەزبەر؛ زبەر؛ بە وەر؛ گوتنەوەی نووسراوە، شیعر یان پەخشانێک بە بێ چاو لێکردن.

⊡ **ازبر بودن** ☜ **از برداشتن**

**ازبر خواندن:** لە بەر وتن؛ دەقێک لەبەر خوێندنەوە.

**از برداشتن:** لە بەر بوون؛ از بر بودن: **از بر بودن**

**ازبر کردن:** بەرکردن؛ لە بەرکردن؛ دەرخکردن؛ دەقێک بە دڵ سپاردن.

هەروەها: **ازبر شدن**

**ازبرکردنی** / azbarkardanî'، ـها/: *صفت.* لەبەرکردنی؛ دەرخی؛ بە بار و دۆخێکی پێویست و گونجاو بۆ لە بەر کردن.

**ازبک** / ozbak'/: [مغولی]/*اسم.* ئوزبەک: ۱. ناوی گشتی خەڵکی زەرد پێست و رەگەز تورکی دانیشتووی ئوزبەکیستان لە ئاسیای ناوەڕاستدا ۲. /ها؛ ـان/ هەر یەکە لە خەڵکی ئەو هۆزە ۳. زمانی ئوزبەکی.

**ازبکی** / ozbakî'/: [مغولی]/*اسم.* ئوزبەکی؛ زمانی خەڵکی ئوزبەک، لە زمانگەلی ئۆراڵ- ئاڵتایی.

**ازپاافتاده** / azpāoftāde, -'oftāde' ـها؛ ـگان/: *صفت.* لە پێ کەوتوو؛ بێ تەشە؛ بێ هاز؛ بێتان؛ بێتقاب؛ لە پاکەفتی؛ بێ هێز و بێ تین لە درێژەدانی تەقالا و تێکۆشاندا.

**ازت** / azot'/: [فرانسوی] ☜ **نیتروژن**

**ازته** / azote'/: [فرانسوی] *صفت.* ئەزۆتدار؛ نیترۆژندار.

**ازجان‌گذشته** / azcāngozašte'، ـها؛ ـگان/: *صفت.* لە خۆ بوردوو؛ لە گیان بوردوو؛ گیان لە سەر دەست.

**ازخدابی‌خبر** / azxodābîxabar'، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت.* لە خوا دوور؛ خوا نەناس؛ بێ بڕوا بە خوا یان بێ خەبەر لە ئامۆژگاریگەلی خواناسی.

**ازخداخواسته** / azxodāxāste'/: *قید.* لە خواییەوە؛ لە خوا گەرەک بووگ؛ بە خوازیاری و تامەزرۆیەکی زۆرەوە ‹تا گفت برو، من هم ـــ از خدا خواسته ـــ راه افتادم: لە خواییەوە گوتی برۆ، منیش کەوتمە ڕێ›.

**ازخودبیگانگی** / azxodbîgānegî'/: *اسم.* *[روانشناسی]* لە خۆ نامۆیی؛ لە خۆبێگانە یی؛ لە خۆ بوویی؛ نەخۆشیەکی ڕەوانییە دەبێتە هۆی نامۆ بوونەوەی نەخۆش لە دنیای دەور و بەری و کار لێ‌نەهاتووی.

**ازخودبیگانه** / azxodbîgāne'، ـها؛ ـگان/: *صفت.* لەخۆنامۆ؛ لەخۆبووگ؛ لەخۆبێگانە؛ لەخۆ بیانی؛ نەخۆشی لەخۆ نامۆیی.

**ازخودراضی** / azxodrāzî'، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت.* گوڕێخ؛ لەخۆ بایی؛ بەفیز؛ لەخۆ رازی؛ خۆپەسن؛ وێ وین.

**ازخودگذشتگی** / azxodgozaštegî'، ـها/: *اسم.* لە خۆبوردوویی؛ کار و ڕەوتی چاو لە گیان یان ماڵی خۆ پۆشین، لە بەر کەسێک یان ئامانجێک.

**ازخودگذشته** / azxodgozašte'، ـها؛ ـگان/: *صفت.* لە خۆ بوردوو؛ دەست لە ژیان بەرداو؛ خوازیاری لە خۆ بوردوویی.

**ازدحام** / ezdehām'، ـها/: [عربی]/*اسم.* جمە؛ گورمۆرە؛ ئاپۆرە؛ پڕ؛ کۆما؛ گژگژ؛ گورتل؛ هەزارەزیلە؛ زلە؛ حەشامات؛ خلەپۆرت؛ گوردەم؛ هەیشت؛ قەرەباڵغ؛ چڕەبەندان؛ پڕایی و تێکەڵ‌ـپێکەڵی.

⊡ **ازدحام کردن:** کۆبوونەوە؛ ئاپۆرەدان؛ کۆمرەدان؛ کەڵەکەکردن؛ لێک وەرهاتن؛ دابااران؛ پوورەدەی؛ لە شوێنێک گلێر

بوونـــه‌وه، لێـــک ترنجـــان و هـــه‌را و هوریـــا کـردن. هـه‌روه‌هـا: **ازدحـام بـودن؛ ازدحـام شدن**

**ازدحـــــام‌هراســـــی** / 'ezdehāmharāsî/: [عربـی/ فارسـی] /اسـم. [روانـشناسی]/ تـــه‌ره‌دوا؛ ترسی نه‌خۆشانه له شوێنی پڕ له خه‌ڵک.

**از دســـت‌رفتـــه** / 'azdastrafte، ـهـا؛ ـگـان/: صـفت. لـه ده‌سـت‌چـوو؛ لـه کـیس‌چـووگ؛ لـه ده‌س چیـو؛ بـه بـێ ده‌سـت پێگه‌یـشتن یـان کـارایی پێـشوو ‹زندگی از دست رفته: ژیـنی لـه ده‌ست‌چوو›.

**ازدواج** / 'ezdevāc، ـهـا/: [عربـی] /اسـم. ۱. جـــووت‌بـــوون؛ ژن و شـــوویی ۲. لفگـــری؛ لفگـیری؛ یـه‌ک‌گـیری؛ هـه‌ڵـوه‌ژاردنی دوو بـه دووی شـتان ۳. [گفتـاری] زه‌مـاوه‌ن؛ زه‌مـاوه‌نـد؛ زه‌ماوه‌نه؛ زه‌هاسه؛ گۆڤه‌ند؛ گۆبه‌ند.

▣ **ازدواج کـردن:** جـووت‌بـون؛ لفگـرتن؛ شـوو کردن یان ژن هێنان.

**بـه ازدواج کـسی درآمـدن:** بوونـه هـاوژینی که‌سێک؛ بوونـه هـاوجووتی کـه‌سـێ؛ بوونـه ژنی کـه‌سـێ. هـه‌روه‌هـا: **بـه ازدواج کـسی درآوردن**

**ازدیـــــاد** / 'ezdiyād/: [عربـــی] /اســـم. زۆری؛ فره‌یی؛ ڕه‌وتی زێده بوون؛ زۆر بوون.

**ازرق** / 'azraq/: [عربـی] صـفت. [ادبی] نیلـی؛ چـویتی؛ کـه‌وگ؛ خمـی؛ کـه‌وه؛ کـۆ؛ کـه‌و؛ کۆڵه.

**ازرق‌چـــشم** / 'azraqčešm ، ـهـا؛ ـان/: [عربـی/ فارسی] صفت. [ادبی] چاوکه‌وگ؛ چه‌مه‌کۆڵه.

**ازرق‌فـــام** / 'azraqfām/: [عربـــی/ فارســـی] صفت. [ادبی] نیلیواشه؛ که‌وگ؛ خمیگۆن.

**از زیر کـــاردررو** / 'az.zîrekārdar.row، ـهـا/: صفت. [گفتـاری] هه‌مین؛ خۆ لـه کـار نـه‌ده‌ر؛ کـار نه‌ویـست؛ پـاش‌گـوێ خـه‌ری کـار؛ تـه‌وه‌زه‌ل و مه‌یله‌و بێکاری.

**ازقضا** / 'azqazā/: [عربی/ فارسی] ☜ **قضا**

**از کارافتـــــادگی** / 'azkāroftādegî, -'oftādegî/: اسم. لـه کارکـه‌وتـوویی؛ لـه کارکـه‌وتـه‌یـی؛ پـه‌ک‌کـه‌وتـه‌یـی: ۱. بـار و دۆخـی لـه کـار کـه‌وتـن ۲. بـار و دۆخـی لـه‌ده‌س‌دانی هێـز و توانـای کـار کـردن، بـه هـۆی نـه‌خۆشـیه‌کـی سه‌خت یان ناته‌واوی ئه‌ندامیه‌وه.

**از کارافتـــاده** / 'azkāroftāde, -'oftāde، ـهـا؛ ـگان/: صفت. له کارکـه‌وتـه؛ لـه کـه‌ڵـک‌کـه‌وتـه؛ بـێ‌بـه‌هـره؛ لـه کارکـه‌وتـوو؛ لێکـه‌فتـگ؛ په‌ک‌که‌وته؛ کـه‌فتـه‌کـار؛ ئاڕفتـه؛ کـه‌ڵـک‌بـڕاو؛ ژهێزکه‌تی؛ له‌کارتـه؛ لـه‌کارکـه‌فتـگ؛ لـه‌نگـه‌ر؛ لێ‌که‌وتوو؛ خرخپ‌که‌فته.

**از کیا** / 'azkiyā/: [عربی] جمعِ ☜ **زکی**

**از گیـــل** / 'azgîl، ـهـا/: اسـم. ئیزگیـــل؛ گـــویژه‌مـــازه‌نی: ۱. داری ئیزگیـــل ۲. میـــوه‌ی ئیزگیـــل؛ میـــوه‌یـــه‌کـــی مێخۆشـــی ئـــاوداره، ئه‌وه‌نده‌ی گویژێک ده‌بێ.

**ازل** / 'azal/: [عربـــی] /اسـم. ئـــه‌زه‌ل؛ ئـــه‌زه‌ڵ؛ پێشینه‌ترین: ۱. کـاتی بـێ ده‌سـپێک کـه هـه‌ر بووه ۲. [فلسفه] بـێ‌سـه‌ره‌تـا؛ ئـه‌وه‌ی هـه‌ر بـووه و هه‌رده‌مێنێ؛ ئه‌و شـته کـه ده‌سـپێکی نـه‌بـێ یان بوونی هه‌میشه‌یی و هه‌تاهه‌تاییه.

**ازلـــی** / 'azalî/: [عربـــی] صـــفت. ئـــه‌زه‌لی؛ ئه‌زه‌ڵـی؛ هـه‌ربـوو؛ هـه‌میـشه‌یـی؛ هـه‌میـشه‌وا؛ جاویدان.

**ازلیـــــت** / 'azalîyyat/: [عربـــــی] /اســـم. هه‌تاهه‌تایی؛ هه‌رمه‌نی؛ هه‌رماوی.

**ازمـــــابهتران** / 'azmābehtarān/: اســـم. [مجـازی] مـه‌چێتـر: ۱. جنۆکـه؛ هـه‌جننـه ۲. ده‌سـه‌ڵاتـداران؛ مـل‌پانـان؛ سـه‌ر زلان؛ خـاوه‌ن زۆر و ده‌سچووانی کۆمه‌ڵگا.

**ازملـــک** / 'azmalak ، ـهـا/: [معـرب از لاتینـی] اسم. قنگاوله؛ قنگاولێ؛ دووپـه‌لـه؛ گیایـه‌کـه بـه ســـاقه‌تـــه‌ی دڕک‌دار و گوڵـــی ســـه‌وزی

هۆشەییەوە کە بۆ دەرمان بەکەڵکە: **ازملکی**

**ازملکی** / 'azmalakî'/: [معرب] ☜ **ازملک**

**ازمنه** / 'azmene, 'azmane'/: [عربی] جمعِ ☜ **زَمان**

**ازن**/ 'ozon'/: [فرانسوی/ انگلیسی] /اسم. ئۆزون؛ گازێکی ئاوی کاڵ و بۆدارە لە سەرووی هەوادا و بەر ئازاری تیشکی خۆر دەگرێ: **اُوزن**

**از و التماس** / 'ezzo'eltemās'/: [فارسی/ عربی] ☜ **اِزّوجِز**

**ازوجز** / 'ezzocez'، ـها/: اسم. *[گفتاری]* تکا و لاڵە؛ ناڵە و نووکە؛ لاڵە؛ لالکە؛ لاڵە و پاڵە: **ازّوجز؛ ازّوالتماس**

▣ **ازّوجزکردن**: لالانەوە؛ لاڵیانەوە؛ پاڕانەوە؛ تکا و لاڵەکردن.

**به ازّوجز افتادن**: کەوتنە لالانەوە؛ کەوتنە پاڕانەوە؛ کەوتنە لاڵە و پاڵە؛ دامان و کەوتنە لالانەوە.

**ازوچز** / 'ezzočez'/ ☜ **ازوجِز**

**ازهم‌پاشیدگی** / 'azhampāšîdegî'، ـها/: [عربی] /اسم. لێک‌بلاوی؛ لێک‌پەرژاوی؛ لێک‌بەربوویی؛ داوەشیاگی؛ هەرشیاگی؛ هەراش‌ـهەراشی؛ پەرپتین؛ هەرشاوی؛ پروسکانی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لێک بەر بوون.

**ازهم‌پاشیدن** / 'azhampāšîdan'/ ☜ **هم**[1]

**ازهم‌پاشیده** / 'azhampāšîde'/: صفت. لێک‌بلاو؛ لێک پەرژاو؛ هەراش؛ لە بەریەک هەڵوەشاو؛ ڕیزاڵ؛ دارزاو؛ داتۆلاو؛ دارزیاگ؛ دارزیو؛ داپژیاگ؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی لێک بەربوون و نەمانی یەکپارچەیی.

**ازهم‌گسسته** / 'azhamgosaste'/: صفت. لێک‌براو؛ لێک‌پساو؛ لێک‌قەتیاو؛ دەس لە یەک بەرداگ؛ دۆخ یان چۆنیەتی لە بەر یەک چوون.

**ازیادرفته** / 'azyādrafte'، ـها؛ ـگان/: صفت. لە یاد چوو؛ لە بیرەوەچوو؛ لە بیرەوچووگ؛ لە بیرکراو؛ جەویرشیە؛ لە بیربراو؛ دورزتی؛ فەرامۆش‌کراو.

**ازینرو** / 'azînrû'/: حرف. *[ادبی]* بەم‌بۆنەوە؛ بۆیە؛ بەم‌هۆیەوە؛ لەبەر ئەمە؛ پۆکێ؛ پەوکێ؛ پەوکی؛ پەوکەی؛ پەرەوکێ؛ پەوچی ‹فردا نمی‌توانم بیایم، ازینرو بهتر است امروز کار را تمام کنم: بەیانی بۆم ناکرێ بێم، بۆیە باشترە ئەمڕۆ کارەکە تەواو بکەم›.

**اژدر** / 'ajdar, 'ejdar'، ـها/: اسم. ئەژدەر؛ جۆرێ مووشەکی ژێر ئاو.

**اژدرافکن** / 'ajdarafkan'، ـها/: اسم. ئەژدەرخەر: ۱. قایقی توند و تیژ بۆ هەڵگرتن و خستنی ئەژدەر ۲. کەسێ کە بەو ئامرازە کار دەکا.

**اژدرانداز** / 'ajdarandāz, 'ejdar-'، ـها/: اسم. ئەژدەرخەر؛ ئەو کەسەی بەرپرسی خستنی ئەژدەرە.

**اژدرمار** / 'ajdarmār, 'ejdar-'، ـها؛ ـان/: [عربی] /اسم. ئەژدەرمار؛ تیرەیەک ماری گەورە کە زۆرتر بێ‌ژارن.

**اژدها** / 'ejdehā, 'ajdahā'/: [عربی] /اسم. زیا؛ هەژدیها؛ حەزیا؛ زەها؛ هەزیا؛ ڤژاف؛ عەزیا؛ حەفی؛ ئەڵهوو؛ ئەژدیها؛ ئەژدەها؛ زهار؛ زهاک: ۱. ـها؛ ـیان/ ماری گەورەی چیرۆکان کە لە دەمیەوە ئاگر دەبارێ، باڵ دەگرێتەوە و زیان دەگەیێنێ ۲. *[نجوم]* برجێکی ئاسمانی ۳. شامار؛ زرەمار؛ ماری گەورە.

▣ **اژدهای پرنده**: زیافرە؛ هەژدیهای باڵگر؛ ئەژدەهای فرندە.

**اژکتور** / 'ejektor'، ـها/: [فرانسوی] /اسم. تورومپا.

**اس** / 'os(s)'، اساس/: [عربی] /اسم. *[نامتداول]* بناغە؛ بنەڕەت؛ بنەما؛ پێزە؛ شەنگستە.

◙ **اس اساس:** */مجازی/* بەردی بناغە؛ بەردی بنەڕەت.

**اسائه** / 'esā'e/: [عربی]/*اسم*. ١. خراپکاری ٢. خراپەکاری؛ خوو و ڕەوشتی خراپ ٣. خراپی؛ چەوتی.

◙ **اسائەی ادب:** بێئەدەبی؛ ڕووداری ‹اگر خدا نکرده بە جنابعالی اسائەی ادب شده، باید بە بزرگواری خودتان ببخشید: ئەگەر خوا نەخواستە بە بەڕێزتان بێئەدەبیەک کراوە، دەبێ بە گەورەیی خۆتان ببوورن›.

**اساتید** / asātîd/': [عربی] جمعِ ☜ **أستاد**

**اسارت** / esārat, 'asārat/': ـها/: [عربی]/*اسم*. دیلیەتی؛ دۆساخی؛ هێسیرێنی؛ یەخسیری؛ بەردەستی: ١. کۆیلایەتی؛ کۆیلەتی؛ کۆیلەیی؛ کۆلەتی؛ لێزیەتی؛ بەنەیی ٢. گیرۆدەیی؛ گراوی.

◙ **بە اسارت افتادن:** بە دیلی گیران؛ بە دیل گیران؛ بە دیل چوون؛ دیل بوون.

**بە اسارت بردن:** بە دیل گرتن؛ بە دیلی بردن.

**بە اسارت گرفتن:** دیل کردن.

**اسارتبار** / esāratbār, 'asārat-/': [عربی/ فارسی] *صفت*. دیلمەندانە؛ دۆساخانە؛ مایەی دیلی ‹قرارداد اسارتبار: بریارنامەی دیلمەندانە›.

**اسارون** / asarûn/': [؟]/*اسم*. هەنیووکە؛ هەنیۆکە؛ ڕووەکێک لە تیرەی کالەکەمارانە کە لە ناو جەنگەڵ و شوێنی ساردەسێردا دەڕوێ و بۆنێکی ناخۆشی هەیە.

**اساس** / asās/': ـها/: [عربی]/*اسم*. بناخە؛ بناغە؛ بنواشە؛ بنەڕەخ؛ بنەڕەت؛ شەنگستە؛ خیم؛ هیم؛ هێم؛ بنچینە؛ بنچەک؛ ما؛ سۆکین؛ تین؛ کرۆک ‹اساس کار باید درست باشد: بناخەی کار دەبێ دروست بێ›.

**اساساً** / asāsan/': [عربی]*قید*. هۆرا؛ لەخۆی دا؛ لە بنەڕەتدا؛ لە بنەڕەتا؛ جە بنەنە؛ لە بنەڕەتەوە؛ لە ماوە ‹این خانه اساساً خراب است: ئەم ماڵە لە بنەڕەتدا خراپە›.

**اساسنامه** / asāsnāme/': ـها/: [عربی/ فارسی] /*اسم*. بنواشەنامە؛ هێمنامە؛ کۆمەڵەی ڕێوڕەوشتێک کە بە مەبەستی بەڕێوە چوونی کار لە بنکەیەکدا (هاوبەشگە، ئەنجومەن، ڕێکخراوە) دارێژراوە.

◙ **اساس نهادن:** قەناندن؛ هیم دانان؛ بناغە دارژتن/ دارشتن.

**اساسی** / asāsî/': [عربی] *صفت*. کرۆکی؛ بنەڕەتی؛ هیمی؛ بناخەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە بناخەوە ‹کار اساسی: کاری بناخەیی›.

**اساطیر** / asātîr/': [عربی] جمعِ ☜ **أسطوره**

**اساطیری** / asātîrî/': [عربی] *صفت*. دیرۆکی؛ ئەفسانەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئەفسانە و دیرۆکەوە.

**اسامی** / asāmî/': [عربی] جمعِ ☜ **اِسم**

**اسانس** / esāns/': ـها/: [فرانسوی]/*اسم*. ئیسانس: ١. ماکێکی بۆنخۆش یان خۆش چێژە کە زیاتر لە گوڵ و میوە دەگیردرێ ٢. شیرە؛ جەوهەر.

**اسب** / asb/': /*اسم*. ئەسپ؛ هەسپ؛ ماڵ؛ چروە: ١. /ـها؛ ـان/ یاو؛ گیانلەبەرێکی ئاڵفخۆر، سواریدەر و بارهەڵگرە بە دەنگ و ڕەگەزگەلی جۆراوجۆر و ناوی جیاجیاوە ٢. یەکێ لەمۆرەکانی شەترەنج ٣. حەوتەمین ساڵ لە ساڵگەلی ڕۆژمێری تورکستانی ☜ **تقویم** ٤. بەشێک لە ماشێنی ترەیلی کە موتور و وەتاغ دەگرێتەوە.

◙ **اسب آبی:** ئەسپی ئاوی؛ گیانلەبەرێکی ئاڵفخۆری زۆر گەورەی دەست و پێ کورتە کە لە ئەفریقا، لە پەنای چۆم و پاڵ ڕووباراندا دەژی.

**اسب ابلق:** کل؛ ئەسپی سپیلک؛ ئەسپی خاڵ‌خاڵی سپی و ڕەش و...

**اسب اصیل:** مانەک؛ ئەسپی ڕەسەن؛ هەسپی کەحێل.

**اسب بخار:** یەکەی پێوانی توان (قەوەتی ماشین) بەرانبەر بە ٧٤٧,٧ وات.

**اسب تازی:** ئەسپی عەرەبی؛ نەژادێکی بەناوبانگی ئەسپە کە زۆر جوان و وریا و بەتاقەتە: **اسب عربی**

**اسب تشریح:** *[کنایی]* ئەسپی لەڕ؛ ئەسپی وا کە ئێسکەکانی لە ژێر پێستەوە دیاربێ.

**اسب تعلیم‌ندیده:** وشکەڕۆ؛ ئیشکەڕۆ؛ ئەسپی ڕانەهێنراو.

**اسب چپ:** ئەسپێک کە لاقێکی سپی و سێ لاقی ڕەش بێ.

**اسب چموش:** تووش؛ چارەوای کارگز و هاوێژ.

**اسب خوشرو:** بەدەو؛ ئەسپی خۆشبەز.

**اسب راست:** ئەسپێ کە لاقێکی ڕەش و سێ‌لاقی سپی بێ.

**اسب رام‌نشده:** سەروشک؛ ئەسپی ڕانەهێنراو؛ تۆڕ؛ ئەسپی یاخی؛ چارەوای بار نەکراوی زین نەدیتوو.

**اسب رودخانه:** ئەسپی ئاوی.

**اسب رهوار:** یەکران؛ خۆشبەز؛ ڕەجوان؛ ڕەهوان؛ ڕەوان؛ ئەسپی خۆشڕۆ.

**اسب سرکش:** تۆسن؛ سەرکێش؛ نارام.

**اسب شاه:** ئەسپی شا؛ ئەسپی شەترەنج، ئەوی لە شا نزیکترە. هەروەها: **اسب وزیر**

**اسب عربی** ☜ **اسب تازی**

**اسب غنیمتی:** یەخترمە؛ یەختەرمە؛ ئەسپ و ماییني تالانی.

**اسب گشن:** مایین بەراز؛ مایین وەراز؛ ئەسپی فەحل کە ماینی لێ چا دەکەن.

**اسب ماده:** ماین؛ ماهین؛ مەینە.

**اسب مَراد:** *[کنایی]* شانس؛ بەخت.

**اسب مسابقه:** هەسپی بەزا؛ ئەسپی گریوەغار.

**اسب نجیب:** ڕەسەن؛ کەهێل؛ کەحێل؛ کحێل؛ کەحلان؛ محەنەک.

**اسب یدک:** یەخترمە؛ یەختەرمە؛ یەدەک؛ ئەسپێ کە بۆ نۆرە پێکردن دەگەڵ سوارداپە؛ ئەسپی بەزین کە لە دوای سوار دەڕوا.

**اسب یورتمه:** لەقلۆق؛ قەترە؛ قۆرتە؛ ئەسپ یان ماینێک کە بە گورگەلۆقە دەڕوا.

▣ **اسب برداشتن:** ئەسپ هەڵگرتن؛ ڕەڤ‌کردنی ئەسپ.

**اسب پیشکشی را دندان شمردن:** *[کنایی]* داوای باقیەکەی‌کردن؛ چاوچنۆک و زۆر ویست بوون.

**اسب تاختن:** ئەسپ تاودان؛ غاردانی ئەسپ؛ هەسپ لینگاردن؛ ئەسپ لنگاردان.

**اسب دادن و خر گرفتن:** *[کنایی]* کەر بە کۆپان گۆڕینەوە؛ سەودای بێ‌قازانج و بە زەرەرکردن.

**اسب را تاراندن:** تاودانی ئەسپ؛ غاردانی ئەسپ.

**اسب زین کرده را سوار شدن:** *[کنایی]* حازر خواردن؛ بەهرە بردن لە بەرهەمی کاری کەسانی‌تر.

**اسباب** / asbāb'/: [عربی]/*اسم*. ١. جمعِ ☜ **سَبَب** ٢. ئەسپاب؛ ئامێر و ئالاف؛ کەل‌وپەل؛ ئەنجاڵ؛ ئەسپاو؛ ئەشمەک؛ شمەک؛ ئامراز؛ ئامێر؛ واڵە؛ وردەواڵە ‹اسباب کار: کەل‌وپەلی کار› ٣. هۆ؛ مایە ‹اسباب دلخوری: هۆی دلمەندی›.

▣ **اسباب بازی** ☜ **اسباب‌بازی**

**اسباب زحمت:** *[گفتاری]* هۆی زەحمەت ‹اسباب زحمت برایتان فراهم کردیم: بووینە

هوی زەحمەتتان›.
**اسباب سفر** ☜ **توشه ـ۲**
**اسباب صورت**: دەم و چاو؛ ئەندامەکانی ڕوومەت (وەک چاو، برۆ، دەم، گوێ و...).
**اسباب کار**: ئامرازی کار؛ ئامێری پێویست بۆ ئەنجامدانی کار.
▣ **اسباب حرف شدن**: *[گفتاری]* قسه لێ هەستان/ هەڵسان؛ هۆی وتوویژی ناخۆش بوون ‹کاری کن که اسباب حرف نشود: وابکە قسەی لی هەڵنەستی›.

**اسباب‌بازی** / 'asbāb(e)bāzî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* لیزۆک؛ لێزۆک؛ لەیزۆک؛ لەیزتۆک؛ لەیستۆک؛ لیستۆک؛ ئامرازی گەمە.

**اسباب‌چینی** / 'asbābčînî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* پێکهانی؛ ڕەوتی بەرهەڤکرنی دەسپێکی پێویست بۆ جێبەجێ کردنی کارێک.

**اسباب‌سفره** / 'asbāb(e)sofre/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کاسەوکەوچک؛ کاسەوکوچەڵە؛ دەفر؛ ئەسپاو سەر سفرە؛ ئەوشتانەی کە لە کاتی چێشت خواردندا پێویستن (وەک کەوچک، چنگاڵ، خوێدان و...).

**اسباب‌کشی** / 'asbābkešî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ماڵ گۆزینەوە: ۱. کار یان ڕەوتی بردنی هەموو یان بەشێکی زۆر لە کەل-پەلی کار یان ماڵ، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ۲. *[مجازی]* ئەسپاوکێشی؛ کەلوپەل کێشی؛ گواستنەوە؛ گۆزانەوە؛ گۆزینەوە؛ ماڵ گۆزانەوە؛ یانەوە وارەی ‹هفتەی دیگر اسباب کشی دارند: حەوتوویەکی تر ماڵ گوزینەوەیانە› * **اثاث‌کشی**

**اسبان** / 'asbān/: *اسم.* یەکسم؛ چارەوێیان؛ یەکسم گەل؛ یەکسمان (وەک ئەسپ و هێستر و قاتر و کەر).

**اسبداری** / 'asbdārî، ـها/: *اسم.* ۱. گەوڕ؛ تەویلە؛ تەوێڵە؛ پشتێر؛ پشتیر؛ جێگەی ڕاگرتن و بەخێوکردنی ئەسپ ۲. مەیتەری؛ کاری ڕاگرتن و بەخێوکردنی ئەسپ.

**اسبدوانی** / 'asbdavānî، ـها/: *اسم.* غارغارێن؛ شەڕناخێوی؛ شەڕانخێوی؛ کاری غارغارێن بە ئەسپان لەپاڵ یەکتریدا، بۆ هەڵسەنگاندنیان و بەراوردی ڕادەی سوارچاکی سواران.

**اسبرز** / 'asbrez/ ☜ **آسپریس**

**اسبریس** / 'asbrîs/ ☜ **آسپریس**

**اسبق** / 'asbaq/: [عربی] *صفت.* پێشووتر؛ لەمەو بەرتر؛ چیەو وەڵتەر؛ پێشتر لە پێش.

**اسبک** / 'asbak/: *اسم.* دانەی کلیل.

**اسبل** / 'osbol/: *اسم.* *[گفتاری]* ۱. تاڵ؛ سپڵ؛ دێدک ۲. سنان؛ ستان؛ سندان؛ پەنەمانی بن‌هەنگڵ.

**اسپاسم** / 'espāsm، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* *[پزشکی]* ڕەگ‌گرتوویی؛ گیرانی کوتوپڕی و توندی یەک یان چەند ماسوولکەی لەش.

**اسپاگتی** / 'espāgetî/: [فرانسوی/ انگلیسی از ایتالیایی] *اسم.* ماکارۆنی.

**اسپانیائی** / 'espān(i)yā'î/ ☜ **اسپانیایی**

**اسپانیایی**[1] / 'espān(i)yāyî/: *اسم.* سپانیول: ۱. لە زمانە ڕۆمیەکان کە ئێستا لە سپانیا، میکزیک، ئەمریکای ناوەندی و باشووری قسەی پێ‌دەکەن ۲. ـها؛ ـیان/ خەڵکی سپانیا * **اسپانیول؛ اسپانیائی**

**اسپانیایی**[2]: *صفت.* سپانی؛ سپانیایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە سپانیا ‹موسیقی اسپانیایی: مووسیقای سپانی›: **اسپانیائی**

**اسپانیول** / 'espānyol/: *صفت.* سپانیول؛ سپانیایی.

**اسپر** / 'espar، ـها/: *اسم.* *[قدیمی]* ئاسپەڕ؛ بارووم؛ دیوارۆکەی لە حەوشە و پێش وەتاخ دروستکراو بۆ ئەوەی لە دەرەوە نێو ژوورەکە

دیار نەبێ.

**اسپرانتو** / esp(e)ranto'/: [فرانسوی]/اسم. سپرانتۆ؛ یەکێ لە زمانە داندراوەکان، بۆ باشتر لێک گەیشتنی گەلان، دانراوی دوکتور زاینهوفی لیهستانی (١٨٥٩-١٩١٧ ز.).

**اسپرت**[1] / esport'/: [انگلیسی]/اسم. وەرزش.

**اسپرت**[2]: صفت. ١. وەرزشی ٢. وەرزشکار؛ وەرزش دۆست.

**اسپرز** / esporz'/:/اسم. تاڵ؛ تەحاڵ؛ سپڵ؛ دیدک؛ دیدەڕەش.

**اسپرزه** / esporze'/ ☜ **اسفرزه**

**اسپرس** / esper(e)s'، ـها/:/اسم. خاشە؛ شەوەرە؛ شەوەن؛ ڕوەکێ لە تیرەی شەوەرگ کە ئالفێ خۆشخۆری بۆ ئاژەل هەیە.

**اسپرغم** / esparqam' ، ـها/:/اسم. ئەسپەرەم؛ ڕەشەڕێحانە؛ سیاو ڕێحان: **شاه اسپرغم؛ شاهسپَرَم**

**اسپرک** / esparak' ، ـها، ـان/:/اسم. پیژگ؛ ئەسپەرە؛ گێنوو؛ زەرتک؛ خاکشیرە دەیمیلە.

**اسپرم** / esperm'، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ١. ئیسپێرم؛ تۆم؛ بەشی گیانداری بە جوولە لە نێو تۆماوی نێرینەدا ٢. [مجازی] شاوەت؛ ئاوی پشت؛ تۆماو: **اسپرماتوزوئید**

**اسپرماتوزوئید** / espermātozo'îd' ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [زیستشناسی] ☜ **اسپرم ـ ١**

**اسپری** / esp(e)rey' ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. پژانە؛ ئامێرێک کە تراو دەپژێنێ * **آیروسل؛ افشانه**

**اسپریز** / asprîz'/ ☜ **آسپریس**

**اسپریس** / asprîs'، ـها/:/اسم. تەراتێنگا؛ لنگارگە؛ مەیدانی غارغاران؛: **اسبریس؛ اسبرِز؛ اسپریز**

**اسپست** / aspest' ، ـها/:/اسم. وێنجە؛ یۆنجە؛ زەرەک.

**اسپند** / espand'/ ☜ **اسفَند**

**اسپندان** / espandān'/:/اسم. خردل سفید ☜ **خردل**

**اسپنددانه** / espandāne'/ ☜ **اسفَنددانه**

**اسپیره** / espîre'، ـها/: [فرانسوی]/اسم. تەولەکێ؛ تەپلەقوو؛ تەپلەهەلالە؛ بنەگیایەکی گوڵ چێرەیی وەک هۆشەیە کە لە پەنای جۆگە ئاو و نێو مێرگەدا سەر دەردێنێ.

**است** / ast'، هستند/: فعل. ـە؛ ـا؛ ـەن؛ ـیە؛ ـن؛ ـنە؛ نیشانەی کاری بوون لە سێهەم کە سی تاک لە کاتی ئێستادا ‹هوا گرم است: هەوا گەرمە›.

**استاتیک**[1] / estātîk'/: [فرانسوی]/اسم. ستاتیک؛ وێستاوی؛ لقێ لە زانستی میکانیک کە باسی چۆناوچۆنی کاری هێزگەل بەسەر شتێکی وەستاودا دەکا.

**استاتیک**[2]: صفت. ستاتیک؛ وێستاو.

**استاتیکی** / estātîkî'/: [فرانسوی] صفت. ستاتیکی؛ سەبارەت بە زانستی ستاتیک.

**استاد**[1] / ostād'، ـها؛ ـان؛ اساتید/: [عربی]/اسم. ١. مامۆستا؛ مامۆسا؛ وسا؛ کەسی خاوەن جۆرێکی زانست یان کارامەیی کە کەسانی تر فێر دەکا ٢. وەستا؛ وسا؛ یوسو؛ ئسا؛ ئوسا؛ سنعاتکار؛ کارزان؛ زانا لە کار؛ سەرناوێ بۆ بانگ کردنی کەسانی کارزان ‹استاد نجار؛ استاد آهنگر: وسا دارتاش؛ وەستا خالە› ٣. مامۆستا؛ ئوستاد؛ هۆستە؛ خاوەن بانترین پلەی فێرکاری لە زانکۆدا ‹استاد ادبیات: ماموستای وێژەوانی› ٤. سەرمەلا؛ ڕێبەر و سەرۆکی کایە لە برێ گەمەی مندالاندا.

▣ **استاد راهنما**: مامۆستای ڕێنوێن؛

مامۆستایەک کە خوێندکار لە ڕەوتی لێکۆڵینەوە یان نووسینی نامیلکەدا ڕێنوێنی دەکا.

**استاد شکستەبندی:** کرەکی؛ وەستای شکستەبەند.

**استاد مدعوّ** ☜ **استاد مهمان**

**استاد مهمان:** مامۆستای میوان؛ مامۆستایەک کە بانگ کراوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لە زانکۆیەک دەرس بێژێتەوە: **استاد مدعو**

**استاد همکار:** مامۆستای هاوکار؛ مامۆستایەک لە دەرەوەی لێژنەی فێرکاری زانکۆ،کە لەگەڵ مامۆستایان و خوێندکارانی ئەو زانکۆیەدا چالاکی تۆژینەوەیی یان وانەیی (وەک ڕێک کردنی نامیلکە)ی هەیە.

**استاد**[2]: *صفت.* مامۆستا؛ پسپۆڕ؛ لێزان؛ سەردەرچوو.

▣ **استاد شدن:** بوونە پسپۆڕ.

**استادانە** / 'ostādane/: *قید.* مامۆستایانە؛ پسپۆڕانە؛ زانایانە.

**استادکار** / 'ostādkār، ـها؛ ـان/: *اسم.* سەرئۆستا؛ ئۆساکار؛ وەساکار؛ وەستا.

**استادی** / 'ostādî/: *اسم.* ١. وەستایی؛ ئوستایی؛ وسایی؛ هۆستایی؛ زانایی لە کار؛ کارامەیی لە پیشەدا ٢. مامۆستایی؛ پیشەی مامۆستا.

**استادیار** / 'ostādyār، ـها؛ ـان/: *اسم.* مامۆستا؛ پلەیەکی مامۆستایی لە زانستگا. هەروەها: **استادیاری**

**استادیوم** / 'estād(i)yom، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* هەوشەنگ؛ مەیدانی یاری؛ گۆڕەپانی وەرزە؛ وەرزشتگا.

**استارت** / 'estārt/: [انگلیسی] *اسم.* ١. *[ورزش]* دەسپێک؛ کار و ڕەوتی دەسپێکردن؛ سەرەتای کایە ٢. *[صنعت]* ئیستارت؛ ئامێری وەڕێخستنی موتور: **استارتر**

▣ **استارت زدن:** ڕۆشن کردن؛ هەڵکردن؛ وەکار خستن.

**استارتر** / 'estārter/: [انگلیسی] ☜ **استارت-٢**

**استاژ** / 'estāj/: [فرانسوی] *اسم.* کاروەرزی.

▣ **استاژ دادن:** کاروەرزی کردن.

**استالاکتیت** / 'estālāktît، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ستالاکتیت؛ چلوورەی ئاهەکی ئاوێزان لە میچی ئەشکەوتان.

**استالاگمیت** / 'estālāgmît، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ستالاگمیت؛ چلوورەی ئاهەکی هەڵچوو لە تەختایی ئەشکەوتان.

**استامبولی** / 'estāmbolî/ ☜ **اِستانبولی**[1]

**استامپ** / 'estāmp، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ١. باسمە؛ جەوهەر ٢. مۆر ٣. نەخشی مۆر.

▣ **استامپ زدن/ کردن:** مۆر لێدان؛ مۆر کردن.

**استان** / 'ostān، ـها/: *اسم.* پارێزگا؛ گەورەترین یەکە لە دابەشینی خاکی ئێران کە بریتیە لە چەن شارستان.

**استانبولی**[1] / 'estāmbolî, 'estānbolî، ـها/: *اسم.* ئەسەمۆلی؛ ئەستەموولی؛ جۆرێ دەفری گەورەی دەم والا بۆ گرتنەوەی گێچ و...: **استامبولی**

**استانبولی**[2]: *صفت.* ستامبۆلی؛ سەر بە ئەستەمبووڵ: **اسلامبولی**

**استانبولی‌پلو** / 'estāmbolîpolow, 'estānbolîpolo/: *اسم.* ستامبۆلی؛ ئەسەمۆلیپلاو؛ جۆرێ پلاوی تێکەڵ بە تەماتە و گۆشت و سێفەزەمینە.

**استاندار** / 'ostāndār، ـها؛ ـان/: *اسم.* پارێزگار؛ لێپرسراوی کارگێڕی و بالاترین پایەی وڵاتی ناو پارێزگایەک.

**استاندارد**[1] / 'estāndārd، ـها/: [انگلیسی] /اسم. پێوەر؛ پێومان؛ ستاندارد: ١. ئەوەی لە لایەن دەوڵەتەوە، بە پێی نەریت یان هاوبیری گشتی، وەک وێنە و نیشانەیەک وەرگیراوە ٢. ئەوەی لە لایەن دەوڵەتەوە وەک نیشانەی پێوەری چەندێتی،کێش و سەنگ، درێژایی، بارستایی یان چۆنیەتی دەستنیشان کراوە ٣. دامەزراوەیەکی رەسمی کە وەئەستۆگری چاوەدێری و دانانی ئەو پێوەرانەیە.

**استاندارد**[2]: *صفت.* پێوەر؛ بەرانبەر و داهاتوو رەگەڵ ئەو پێوەرە دەستنیشانکراوانە کە لە لایەن کاربەدەستانەوە داندراوە: **استانده**

**استانداری** / 'ostāndārî/: /اسم. ١. پارێزگاری؛ پیشەی پارێزگار ٢. /ـها/ پارێزگا؛ بەرێوەبەرایەتیەک کە پارێزگار تێیدا کار دەکات.

**استانده** / 'estānde/: [؟] ☜ **استاندارد**[2]

**استبداد** / 'estebdād/: [عربی] /اسم. ١. زۆرەملی؛ ملهوری ‹استبداد رأی: بریاری زۆرەملی› ٢. */سیاست/* زۆربێژی؛ فەرمانرەوایی بەبێ بایەخدان بە بیر و بۆچوونی خەڵک ٣. */سیاست/* سیستەمی وڵاتێک کە تێیدا رێبەران و بەرێوەبەران لە لایەن ئاپۆرە یان نوێنەرانیانەوە هەڵنابژێردرێن.

**استبدادی** / 'estebdādî/: [عربی] *صفت.* زۆرەملانە؛ ملهورانە؛ خاوەن دۆخ یان شێوازی زۆرەملی ‹نظام استبدادی: رێژیمی زۆرەملانە›.

**استبرق** / 'estabraq/: [معرب از فارسی] /اسم. ١. ئاورێشمی زەرچن؛ کووتاڵی زەری: **استبرک** ٢. شیرەدار.

**استبرک** / 'estabrak/: [معرب] ☜ **استبرق-١**

**استبل** / 'establ، ـها/: [معرب از لاتینی] /اسم. گەوڕ؛ گەوەڕ؛ پشتیر؛ پشتێر؛ تەویلە؛ تەوێلە: ١. جێگایەکی سەرگیراو بۆ ڕاگرتنی ئەسپ ٢. جێگای ڕاگرتنی چارویێان ❋ **اسطبل؛ اصطبل**

**استتار** / 'estetār/: [عربی] /اسم. کار یان ڕەوتی داپۆشین؛ داپۆشان؛ داپۆشاندن؛ پۆشنایرە؛ ئەرەپۆشنەی؛ سەر داپۆشینی شتێ بۆ دەرنەکەوتنی.

**استثمار** / 'estesmār/: [عربی] /اسم. چەوسێنەری: ١. بەهرەکێشی لە بەرهەمی کاری دیتران ٢. */اقتصاد/* وەدەست خستنی قازانج و کەڵکی زیادی لە بەرهەمی کاری کەسانی تر. هەروەها: **استثمار شدن؛ استثمار کردن**

**استثنا** / 'estesnā، ـها/: [عربی] /اسم. ١. هاوێر؛ هەڵاوێر؛ بەدەر؛ کار یان ڕەوتی بەدەرکردنی ئەندام یان ئەندامگەلێک لە کۆمەڵەیەکدا لە بریار یان کارێک ‹کشاورزان را باید از شمول این قانون استثنا کرد: جووتیاران دەبێ لەبەرکەوتنی ئەم قانوونە هاویر بکرێن› ٢. /ـات/ جودا؛ جیا؛ جیاواز؛ ئەوەی لە دەرەوەی وەبەرکەوتنی بریار یان کارێکەوە بێت. بەرانبەر: **قاعده** ‹در میان بچەهایش بهار استثنا است: لە نێو منداڵەکانیدا بەهار جیاوازە›. هەروەها: **استثنا بودن؛ استثنا شدن**

▣ **استثنا قایل شدن**: جیاوازی دانان؛ هەموو بە یەکجۆر نەزانین.

**استثنا کردن**: جیاکردنەوە؛ هەڵاوێرکردن؛ لە هەمە لایەن بوونی بریار یان کارێ.

**استثنائاً** / 'estesnā'an/: [عربی] *قید.* جیاکار؛ جیاکارانە؛ بە شێوەی جیاکار ‹استثنائاً او را به سربازی نبردند: جیاکار ئەویان بۆ سەربازی نەبرد›.

**استثنائی** / 'estesnā'î/: [عربی] ☜ **استثنایی**

**استثنایی** / 'estesnāyî/: [عربی] *صفت.* جەبە؛

جیاواز؛ جیاکار: ۱. جیاواز لەگەڵ دیتران ‹هوشش استثنایی بود: هۆشی جیاکار بوو› ۲. کەموێنە یا بێوێنە ‹یک معلم استثنایی است: مامۆستایەکی جیاکارە› ❋ **استثنایی**

**استجابت** / estecābat'/: [عربی]/اسم. *[نامتداول]* ڕەوتی قەبووڵکردن؛ گیراکردن؛ وەڵام دانەوە؛ بە دەنگەوە چوون.

**استحاضه** / estehāze'/: [عربی]/اسم. خوێن لێچوونی ناوەختی ژن.

**استحاله** / estehāle'، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. داگەڕانی؛ خولی ئاڵوگۆڕی گیانلەبەرێک تا گەورە دەبێ و پێدەگا ۲. کار یان ڕەوتی هەڵوەشانەوە.

**استحباب** / estehbāb'/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ڕەوابینی؛ باشزانی؛ ڕەوتی بەرێوجێ زانین.

**استحبابی** / estehbābî'/: [عربی] صفت. ڕەوا؛ بەرێوجێ؛ باش.

**استحصال** / estehsāl'، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کار یان ڕەوتی دەسگیر بوون؛ وەگیر هاتن؛بەهرە هەڵگری لە شوێنێک (وەک کان، زەویـن، کارخانە و...) کە خاوەن داهاتێکی بەکەڵکی ئابوورییە.

**استحصالات** / estehsālāt'/: [عربی]/اسم. *[نامتداول]* داهاتگەل؛ بەرهەمگەل؛ ئەوەی کەڵکی لێ وەرگیراوە.

**استحضار** / estehzār'/: [عربی]/اسم. ئاگاداری؛ بار و دۆخی خەبەردار بوون؛ ئاگادار بوونەوە.

▣ **به استحضار رساندن**: خەبەردارکردن؛ ئاگاردارکردن.

**استحفاظ** / estehfāz'/: [عربی]/اسم. ۱. چاوەدێری؛ پارێزگاری؛ ڕاگرتەیی؛ نواداری ۲. *[نامتداول]* پاسەوانی؛ نواوانی؛ زێرەڤانی.

**استحفاظی** / estehfāzî'/: [عربی] صفت. شیاوی پارێزگاری یان پێویستی ڕاگرتن.

**استحقاق** / estehqāq'/: [عربی]/اسم. شایستەیی؛ بسەرڤەیی؛ شیاوی.

▣ **استحقاق داشتن**: شیاو بوون؛ سزاوار بوون.

**استحقاقی** / estehqāqî'/: [عربی] صفت. شایانی.

**استحکام** / estehkām'، ـها/: [عربی]/اسم. پتەوی؛ گورخی؛ پەیتی؛ قایمی.

**استحکامات** / estehkāmāt'/: [عربی]/اسم. پتەویگەل؛ خانووبەرە و مەتەرێز و کەند و لەندانی دەستکرد بە مەبەستی بەرگری و باشاری.

**استحکامی** / estehkāmî'/: [عربی] صفت. پتەوکەرەوە؛ قایمکەرەوە؛ گورخکەرەوە.

**استحمام** / estehmām'، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کار و ڕەوتی خۆ شۆردن؛ گەرماو کردن؛ مەلەکردن؛ شۆردنی لەش بەتایبەت لە گەرماڤدا.

**استخاره** / estexāre'، ـها/: [عربی]/اسم. جۆرێک فاڵ گرتنەوەی ئایینی بە قورئان و تەزبێح بۆکردن یا نەکردنی کارێک.

**استخبار** / estexbār'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. *[نامتداول]* خەبەرگری؛ هەواڵگری.

**استخدام** / estexdām'، ـها/: [عربی]/اسم. دەسەوکاری؛ کار یان ڕەوتی دامەزراندن؛ بە کار هێنان؛ بەگەڕ خستن؛ مەرزنایرە؛ کار پێکردن؛ بە کار گرتن لە بەرانبەری مزی دیاریکراوەوە.

▣ **استخدام شدن**: دامەزران؛ بەگەڕکەوتن؛ ئەرەمەرزیەی؛ دەسەوکاربین؛ بە کاریگەر یان کارگێڕ لە دامەزراوەیەکدا وەرگیران.

**استخدامی** / estexdāmî'، ـها/: [عربی] صفت. دامەزراوی؛ پێوەندیدار بە کاری دامەزراندنەوە ‹سابقەی استخدامی: پێشینەی دامەزراوی›.

**استخر** / estaxr'، ـها/:اسم. هەسێڵ؛

هەسوێل؛ هەسێر؛ ئەستیل؛ ئەستیر؛ ئەستێل؛ حەسێل؛ ئەستێر؛ ستێر؛ ئەستیلک؛ سیل؛ ئەستێرک؛ هەساری؛ گۆلاو؛ گولەم؛ لیچ؛ لێچ؛ گۆل؛ بۆک؛ حەوز؛ گوەل؛ قۆمی؛ پەنگاوێکی دەستکردی بۆ ئاودێری یان مەلە کردن.

▣ **استخر بازی:** مۆژی نزم و کەمئاو بۆ گەمەی مندالان.

**استخر بزرگ:** هۆڕاو؛ گۆلی گەورە؛ ئەستیری زل.

**استخر طبیعی:** بێرک؛ گۆمیلکە.

**استخر کوچک:** گۆلتک؛ گۆلی کەمئاو؛ ئەستێری پچووک؛ مۆژ.

**استخر سرپوشیده:** هەسێلی سەرگیراو.

**استخر شنا:** هەسێلی مەلە.

**استخراج** / estexrāc'، ـها؛ ـات/: [عربی] /اسم/ کار و ڕەوتی دەرهێنان؛ بەرئاردەی: ١. دەرکێشان؛ دەرهێنانی شتێ لە شوێنێک ‹استخراج زغالسنگ: دەرهێنانی بەردەخەلووز› ٢. کار یان ڕەوتی بە دەست هێنانی سەرئەنجامی تۆژینەوە یان هەلسەنگاندنی بیر و ڕا ‹استخراج آرا: دەرهێنانی دەنگەکان›.

▣ **استخراج آرا:** دەرهێنانی دەنگەکان؛ ژماردنی دەنگەکان.

**استخراج معادن:** دەرهێنانی کانی لە کان.

**استخرداری** / estaxrdārî'، ـها/: /اسم/ هەسێلوانی؛ گۆمەوانی؛ کار یان ڕەوتی دروستکردن یان بەڕێوەبردنی هەسێر.

**استخفاف** / estexfāf'/: [عربی] /اسم. [ادبی]/ ١. کار و ڕەوتی پچووک کردنەوە ٢. بە پچووک زانین ❋ **تحقیر**

**استخلاص** / estexlās'/: [عربی] /اسم. [ادبی]/ ڕزگاری؛ ئازادی؛ داخەلسان؛ ڤەرسان؛ ڕەهایی.

**استخلاف** / estexlāf'/: [عربی] /اسم. [شیمی]/

جێگیری؛ جێگەگیر بوونی ئەتوم یان ئەتومگەلێک لە جێی ئەتوم یان ئەتومگەلی تر لە مولوکوولێکدا.

**استخلافی** / estexlāfî'/: [عربی] صفت. جێگیر؛ جێگرتوو؛ جیەگیربووگ؛ یاگەگیر.

**استخوان** / ostoxān, 'ostexān'، ـها/: /اسم/ ١. ئێسک؛ ئیستک؛ هێسک؛ هێستک؛ هێستی؛ یەسک؛ هەستۆ؛ ئێسقان؛ سقان؛ ئیسخوان؛ سخان؛ پێشە؛ پلان؛ سوقان؛ سۆقان؛ سووقان؛ کاتە؛ وەرسەل؛ چوارچێوەی لەش ٢. [مجازی] عاج.

▣ **استخوان خاصره:** کەلەکە.

**استخوان خرما:** ئێسکەخورما؛ پێشە خورما.

**استخوان درشت:** پەل قەوی؛ پێشە ئەستوور؛ هەستی گەشتک.

**استخوان دنبالچه:** نێک؛ جوچکە سمت؛ مازگا؛ پێشەی کلێنچکە؛ قۆڕگ؛ قلێچکە؛ ئێسکی قنگ.

**استخوان ران:** کولی مەل؛ ئێسکی ڕان؛ نێک؛ پێشەی ڕان، لە ئەژنۆ بەرەو ژوور تا ژێر زگ.

**استخوان زانو:** ڕەقەلە؛ کەشکەژنۆ؛ کەشکە وژنگ؛ زرانی؛ پێدارە ئێسکی سەر ئەژنۆ: **استخوان کشکک**

**استخوان ساق:** ڕەقێنە؛ قولەپا؛ پیشەی پووزوو؛ دروشە؛ قۆر؛ قۆلمە؛ دوریش؛ دوریشک؛ لوولاق؛ گاللۆر؛ لوولاک؛ پێشەی بەلەک.

**استخوان سر:** مەژیچک؛ کاژەڕە؛ کاژەلە؛ کاژەلاک؛ کامێرە؛ کرۆز؛ کاسۆلکە؛ پێشەسەر کە مێشکی تێیدایە.

**استخوان سینه:** پەراسووبەند؛ ڕەفەی سنگ.

**استخوان شانه:** گورمک؛ پێشەی شان.

**استخوان قاب**: قاپووله؛ قاپووره؛ گویزنگ: **بُجول**؛ **پُژول**؛ **اِشتالنگ**؛ **قاپ**

**استخوان کتف**: باڵەکە؛ دەفەی شان؛ پاڕۆی شان.

**استخوان کشکک**: کەشکە زەنگۆڵ؛ کەشکەک؛ کەشکە وژنگ؛ کەشکەژنۆ؛ پێداره: **استخوان زانو**

**استخوان گردن**: گەردەمل؛ پێشەی گەردن.

**استخوان لگن**: کزیە؛ کولۆک؛ کلۆت؛ ئێسکی سمت و کەفەڵ.

**استخوان ماهی**: گووسە؛ ئێسکە ماسی.

**استخوان نشیمنگاهی**: دوو سمتە.

**پوست و استخوان** ☜ **پوست**

⊡ **استخوان ترکاندن**: *[مجازی]* گەورە بوون؛ بای‌باڵدان؛ بە خۆدا هاتن.

**استخوان چریدن**: کراندنەوەی ئێسک؛ کڕاندنەوەی ئێسقان؛ پێشەکڕاندنەوە.

**استخوان خردکردن**: *[مجازی]* ڕەنجدان؛ زۆر زەحمەت کێشان؛ خۆ زۆر ماندوو کردن.

**استخوان درگلو داشتن**: *[مجازی]* دەم بەسیان؛ دەم چوونە کلێڵەوە؛ تیکەگیر کەردەی؛گرفتێک بۆ پەیڤین و قسەی دڵ کردن هەبوون.

**استخوان سبک کردن**: *[مجازی]* چاکە کردن (بۆ کەم کردنەوەی سووچ و گوناح).

**استخوان لای زخم گذاشتن**: *[مجازی]* کردنە لک بەرچاو؛ کەردەی لکۆ چەمی؛ کار بە ناتە واو داخستن و جێگای ناکۆکی بۆ داهاتوو هێشتنەوە.

**استخوان‌بندی** /'ostoxānbandî,'ostexān-/، ــها/: *اسم.* قاپۆڕە؛ قاپڵۆخە؛ قراپووە؛ چوار بەندە؛ چوارچێوەی لەش.

**استخوان‌پزشکی** / 'ostoxānpezeškî, 'ostexānpezeškî/: *اسم.* ئورتۆپێدی؛ ئێسکدەرمانی.

**استخواندار** / 'ostoxāndār, 'ostexān-/: *صفت.* ١. ئێسقاندار؛ پێشەدار ٢. *[پزشکی]* قۆترمە؛ تۆکمە؛ پتەو؛ قایم؛ پەیت؛ گورخ.

**استخوان‌درد** / 'ostoxāndard, 'ostexān- ☜ **ــ درد**[٢]

**استخوان‌شکن** /'ostoxānšekan,'ostexān-/، ــها/: *اسم. [پزشکی]* ئێسقان‌شکێن؛ پێشەشکێن؛ پێشەمار؛ ئامرازی ئێسک شکاندن لە برینکاریدا.

**استخوانی** / 'ostoxānî,'ostexānî/: *صفت.* ئێسقانی؛ سخانی: ١. پێوەندیدار بە ئێسقانەوە ‹بیماری استخوانی: نەخۆشی ئێسقانی› ٢. *[مجازی]* قەمامە؛ نەیچە؛ هەلووک؛ لەڕ؛ داڵگۆشت؛ مردۆخ؛ مردۆخە؛ لەڕ و لاواز ٣. *[مجازی]* وەکوو ئێسقان؛ وەک پێشە ٤. پێشەیی؛ لە جنس ئێسقان.

⊡ **استخوانی شدن**: پێشەکردن؛ بوونە پێشە؛ گۆڕانی بافت و کرەکرە بە ئێسک.

**استدراک** / 'estedrāk، ــها؛ ــات/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ١. کار و ڕەوتی دۆزینەوە؛ دینەوە؛ بینینەوە؛ دیتنەوە ٢. دابین؛ ئابوور؛ پێکهێنان ٣. شی‌کردنەوە؛ لێکدانەوە؛ شرۆفەکردنی زۆری بابەتێک.

**استدعا** / 'ested'ā، ــها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* تکا؛ لالە؛ خوازە؛ داوا؛ خوایشت.

⊡ **استدعای عاجزانه**: پاڕانەوە؛ لالیانەوە؛ لالانەوە؛ ئەوە لالیەی؛ خوایشت لە ڕووی کەم دەسەلاتی یان خاکەساریەوە.

⊡ **استدعا داشتن/ کردن**: ویستن؛ خوازیار بوون.

**استدلال** / 'estedlāl، ــها؛ ــات/: [عربی] *اسم.* ١. کار و ڕەوتی بەڵگە هێنانەوە ‹برای قبولاندن پیشنهادش خیلی استدلال کرد: بۆ

سەلماندنی پێشنیارەکەی زۆری بەڵگە هێناوە›
۲. شێوە یان ڕەوتی کەڵک وەرگرتن لە بەڵگە.

▣ **استدلال کردن**: بەڵگە هێنانەوە؛ بەڵگە نیشاندان.

**استدلالی** / 'estedlālî/: [عربی] *صفت*. ۱. بەڵگەیی ۲. بەڵگەخواز.

**استر** / 'astar، ـها؛ ـان/: *اسم. [ادبی]* هەستەر؛ هستر؛ هێستر؛ هێسر؛ هەسەرە؛ ئێستر؛ ئیستر؛ قاتر؛ قانتر؛ مینەگ؛ داک ماینی کەر باب.

▣ **استر پور اسب**: بالانی؛ ئێستری باب ئەسپی داک ماکەر.

**استراتژی** / 'est(e)rātejî، ـها/: [فرانسوی] *اسم*. ستراتێجی؛ ستراتێژی؛ زانستی کەڵک وەرگرتن لە هەموو هەبوونێکی ڕامیاری، ئابووری، ڕەوانی و چەکداری بۆ پێکهێنانی زۆرترین پشتیوانی لە ڕەوتی ڕامیاری دامەزراودا.

▣ **استراتژی جنگی**: ستراتێژی شەڕانە.
هەروەها: **استراتژی علمی**

**استراتژیک** / 'est(e)rātejîk/: [فرانسوی] *صفت*. ستراتێژیک؛ ستراتیجیک؛ پێوەندیدار یان سەر بە ستراتێژی: **استراتژیکی**

**استراتژیکی** / 'est(e)rātejîkî/: [فرانسوی] ☜ **استراتژیک**

**استراحت** / 'esterāhat/: [عربی] *اسم*. وچان؛ چوترم؛ پیش؛ پشوو؛ ڕەوتی حەسانەوە؛ حەوانەوە؛ سانەوە؛ ئەوەسیەی؛ ڤەسین؛ ئاسوودەیین؛ دەست لە کار کێشان و شەکەتی دەرکردن.

▣ **استراحت دادن**: وچان پێدان؛ ئێسراحەت دان ‹دکتر برایم ده روز استراحت داد: دوکتور دە ڕۆژ وچانی دامێ›.

**استراحت داشتن**: هەبوونی وچان ‹حتی یک دقیقه استراحت نداشتم: تەنانەت ساتێکیش وچانم نەبوو›.

**استراحت کردن**: حەسانەوە؛ حەوانەوە؛ سانەوە؛ سیایوە؛ ڤەسین؛ پاڵدانەوە؛ پیش دان؛ پشوودان؛ وچان دان؛ بێهن‌دان؛ داگراسیان ‹همین جا کمی استراحت کن: هەر لێرە وچانیک بدە›.

**استراحتگاه** / 'esterāhatgāh، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. هەڤانگە؛ حەسانگە؛ ڤەسینگا؛ وچانگا؛ عەنوا؛ جێگەی تێدا حەسانەوە؛ یانگە؛ جێگەی سانەوە.

▣ **استراحتگاه صحرایی**: لاگا؛ جێگەی وچان‌دان لە دەشت.

**استراق‌سمع** / 'esterāqesam'/: [عربی] *اسم*. گوێ‌تەقێ؛ خۆگرتی؛ بە دزیەوە گوێ گرتن لە قسەی خەڵک.

▣ **استراق‌سمع کردن**: گوێ هەڵخستن؛ گوێ تەکان؛ کولە گرتن؛ هەست ڕاگرتن؛ کەڵەکردن؛ گۆشێ ماڵێ وسەی ‹خواهرش از پشت در استراق‌سمع می‌کرد: خوشکی لە پشت دەرکەوە گوێی هەڵخستبوو›.

**استرالیائی** / 'ostorālyā'î/ ☜ **استرالیایی**

**استرالیایی**[1] / 'ostorālyāyî, 'ost(o)rāl(i)yāyî، ـها؛ ـان/: *اسم*. ئوسترالیایی؛ هەرکام لە خەڵکی وڵاتی ئوسترالیا: **استرالیائی**

**استرالیایی**[2]: *صفت*. ئوسترالیایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئوسترالیاوە ‹گوسفند استرالیایی: مەڕی ئوسترالیایی›: **استرالیائی**

**استرئوسکپ** / 'est(e)re'oskop، ـها/: *اسم*. ستێرۆسکۆپ؛ ئامێرێک کە لە دوو شکڵی وەک یەک، وێنەیەکی سێ پاڵوو دەردەخا.

**استرحام** / 'esterhām/: [عربی] *اسم. [ادبی]* لێبوردەخوازی؛ داوای بەزەیی و لێبوردن.

**استرخا** / 'esterxā/: [عربی] *اسم. [ادبی]* خاوی؛ شلی؛ داهێزاوی؛ سستی. هەروەها:

**استرخای اعصاب؛ استرخای اعضا**

**استرداد** / esterdād'/: [عربی]/اسم. [ادبی] گێڕانەوە؛ دانەوە؛ هەڵگەڕاندنەوە؛ ئەوە دەی؛ دایەوە.

▣ **استرداد مجرمین**: دانەوەی تاوانباران.

**استرژن** / estorjen'، ـها/: اسم. ستروژین؛ ماسی خاویار.

**استرس** / est(e)res'، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ۱. دڵەتەپە؛ دڵەڕەپێ ۲. [روان‌شناسی] گوشاری ڕەوانی.

**استرلاب** / ostorlāb'/: [از یونانی] ☜ **أسطُرلاب**

**استرنزیائی** / ostroneziyā'î'/ ☜ **استرنزیایی**

**استرنگ** / estarang'/: اسم. گیائادەمە؛ سێوەخووگانە؛ قیڕەگیا؛ تووڵەزەڕە؛ بەلەدوون؛ حەسەنبەگی؛ گیایەکە بنکەکەی لە بیچمی بنیادەمە، بۆ دەرمان دەشێ.

**استرنزیایی** / ostroneziyāyî'/: اسم. ئوسترونێزیایی؛ دەستەیەک لە زمانگەلی جۆراوجۆری سەر بە دورگەکانی ئۆقیانووسی هێند و ئارام، لە تایوانەوە تا ماداگاسکار و لە مالزیەوە هەتا فیلیپین: **استرنزیائی**

**استرونتیم** / estrontiyom'/: اسم. سترۆنتیۆم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ۳۸ و کێشی ئەتومی ۸۷٫۶۲ سووک، نەرم و چەکوشخۆر، کە تەنیا بە شێوەی لێکدراو هەیە: **اَسْتْرُنسیُم**

**استرونسیم** / estronsiyom'/: [فرانسوی از انگلیسی] ☜ **اَسْتْرُونتیُم**

**استره** / ostore'، ـها/: اسم. [قدیمی] دوزان؛ گوێزان؛ گۆزان؛ گوزان؛ گیزان؛ گیسزان؛ موس؛ مووس؛ کافرمان؛ هەستەرە؛ تیخی مووتاشین؛ چەقۆی سەر و ڕیش تاشین.

**استریپ‌تیز** / est(i)rîptîz'/: [انگلیسی]/اسم. ستیریپتیز؛ جۆرێ هەڵپەڕکێی ڕۆژاوایی کە تێیدا هەڵپەڕکێکەر بەرە بەرە خۆی ڕووت دەکاتەوە.

**استریل** / est(i)rîl'/: [فرانسوی] صفت. ۱. نەزۆک ۲. [پزشکی] پاکژ؛ بەری لە میکرۆب.

**استریلیزاسیون** / est(i)rîlîzās(i)yon'/: [فرانسوی]/اسم. ۱. کار و ڕەوتی نەزۆککردن ۲. کار و ڕەوتی پاکژکردنەوە.

**استریلیزه** / est(i)rîlîze, 'esterlîze'/: [فرانسوی] صفت. ۱. نەزۆککراو ۲. پاکژکراو.

**استریو** / esteryo'/: [انگلیسی] ☜ **اِستِریوفُونیک**

**استریوفونیک** / esteryofonîk'/: [انگلیسی] صفت. [صوت] ستریۆفۆنیک: ۱. بار و دۆخێک کە دەنگ لە هەموو لایەکەوە بە بیسەر بگا (وەک لە برێ سینەمادا) ۲. خاوەن دەنگێکی وەها ❊ **استریو**

**استسقا** / estesqā'/: [عربی]/اسم. [پزشکی] ئاڤزەلێلک؛ تینشکی؛ ئاوبەند؛ زکەماسێ؛ ئیسقایی؛ نەخۆشی زگ ئاوسان.

**استشمام** / estešmām'/: [عربی]/اسم. [ادبی] کاری بۆنکردن؛ بۆن هەڵمژین؛ بۆ هەڵکێشان؛ بۆ هۆرلووشەی.

▣ **استشمام شدن**: بۆنهاتن؛ بۆ ژنەفتن؛ بۆ لێهاتن.

**استشمام کردن**: بۆن پێوەکردن؛ بۆ هەڵمژین؛ بۆکردن.

**استشهاد** / esteŝhād'/: [عربی]/اسم. ۱. کاری گەوا هێنانەوە؛ شاهیدگرتن ‹او به این شعر استشهاد کرد: ئەو ئەم شیعرەی گەوا هێنایەوە› ۲. /ـها؛ ـات/ گەواهی؛ شایەتی؛ گەواهی بەتایبەت بە شێوەی نووسین.

▣ **استشهاد محلی**: شایەتنامە؛ گەواهی ویستن لە دانیشتوانی گەڕەک.

**استصواب** / estesvāb'/: [عربی]/اسم.

چاک‌زانی؛ ڕاست‌خوازی.

**استصوابی** / 'estesvābî/: [عربی] ☜ نظارت استصوابی، **نظارت**

**استضعاف** / 'estez'āf/: [عربی]/اسم. چەوسێنراوی؛ چەوساوی؛ ستەمکێشی؛ بێ‌هێز و لاواز بوون لە بەر بەش‌خوراوی و زۆرلێکراوی.

**استطاعت** / 'estetā'at/: [عربی]/اسم. */ادبی/* دەسەلات؛ توانایی؛ زوخ؛ دەسچوویی ‹من استطاعت این کار را ندارم: من دەسەلاتی ئەم کارەم نیە›.

▣ **استطاعت مالی:** دەسەلاتی ماڵی ‹او استطاعت مالی برای خریدن خانه نداشت: ئەو دەسەلاتی ماڵی بۆ کڕینی خانووی نەبوو›.

**استطاله** / 'estetāle، ـها/: [عربی]/اسم. */ادبی/* ۱. کێشراوی؛ کێشیاگی ۲. ڕیشاڵ؛ هەودای درێژ و باریک ۳. درێژە؛ دواڵە.

**استطراد** / 'estetrād/: [عربی]/اسم. */ادبی/* کار یان ڕەوتی وتە هێنانەوە لە نێوان گوتەیەکی‌تردا.

**استظهار** / 'estezhār/: [عربی]/اسم. */ادبی/* دڵ‌گەرمی؛ پشت‌قورسی؛ دڵ‌قورسی؛ دڵ‌قایمی؛ پشت ئەستووری؛ پشت‌گەرمی.

**استعارات** / 'este'ārāt/: [عربی] جمعِ ☜ **استعاره**

**استعاره** / 'este'āre/: [عربی]/اسم. */دستور/* خوازە؛ کار یان ڕەوتی وەرگرتن؛ خواستنەوە؛ بە کار هێنانی ناوێک لە جێگای ناوێکی تر، بە هۆی وێکچوونیەوە (وەک نێرگز و چاو، کەوان و ئەبرۆ).

**استعاری** / 'este'ārî/: [عربی] صفت. خوازەیی؛ وەرگرتنی.

**استعانت** / 'este'ānat، ـها/: [عربی]/اسم. */ادبی/* یارمەتی؛ یاری؛ پشتگری؛ یاردەی.

▣ **استعانت جستن/ خواستن/ طلبیدن:** یارمەتی ویستن؛ یاردەی واسەی؛ داوای پشتگری کردن. هەروەها: **استعانت کردن**

**استعداد** / 'este'dād، ـها/: [عربی]/اسم. بڕشت؛ لێهاتویی؛ ئامادەیی؛ توانایی؛ بەرهەڤی.

▣ **استعداد اکتسابی:** بڕشتی فێر بوون؛ تواناییەک کە بە هۆی کار و پەروەرشتەوە بەدی دێت.

**استعداد ذاتی:** بڕشتی سروشتی؛ تواناییەک کە زگماک لەگەڵ کەس یان شتێکدایە: **استعداد فطری**

**استعداد رزمی:** بڕشتی شەڕی؛ توانایی بۆ جەنگ.

**استعداد شکوفا:** بڕشتی گەشاوە؛ توانایی پشکووتوو.

**استعداد فطری** ☜ **استعداد ذاتی**

**استعداد نهفته:** بڕشتی نهێنی.

**استعداد هنری:** بڕشتی هونەری.

**استعفا** / 'este'fā، ـها/: [عربی]/اسم. لاگری: ۱. داواکاری کەسێ بۆ دەس لە کار بەردان ۲. کار یان ڕەوتی لاگرتن لە کار و پیشەی خۆ ۳. */گفتاری/* لاگرینامە ‹استعفایش را نوشت و گذاشت روی میز: لاگرینامەکەی نووسی و نایە سەر مێزەکەوە›.

▣ **استعفا دادن:** لاگرتن؛ دەس لە کار کێشان؛ دەس ئاسەی؛ واز لە کار هێنان. هەروەها: **استعفا کردن**

**استعفانامه** / 'este'fāname، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. لاگرینامە؛ نامەیەک کە بۆ لاچوون لە سەر کارێ یان پێگەیەکەوە دەنووسرێ.

**استعلاج** / 'este'lāc/: [عربی]/اسم. */ادبی/* ۱. دەرمان ‹هزینەی استعلاج: خەرجی دەرمان› ۲. */نامتداول/* چارەدۆزی؛ چارەسەری؛ ڕەوتی لە دووی چارە بوون.

**استعلام** / 'este'lām ، ـهـا/: [عربی]/اسم. پرسیاردان؛ کار یان ڕەوتی پرسین بە نیازی ئاگادار بوون لە مەڕ بابەتێکەوە.

◘ **استعلام بها:** نرخخوازی؛ پرسیاری نرخ.

**استعمار** / 'este'mār/: [عربی]/اسم. ۱. ولاتگری؛ داگیرکاری؛ دەست بەسەردا گرتنی هەرد و بوومێک لە لایەن هێزی بێگانەوە بۆ کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوەگەلی هەمەلایەنیەی ئەو ولاتە ۲. [نامتداول] ئاوەدانکاری؛ ئاوانکردنەوە.

◘ **استعمار فرهنگی:** داگیرکاری فەرهەنگی.

**استعمار نو:** داگیرکاری نوێ؛ نوێ داگیرکاری.

**استعمارگر** / 'este'mārgar ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. داگیرکار؛ داگیرکەر.

**استعماری** / 'este'mārî/: [عربی] صفت. داگیرکاری.

**استعمال** / 'este'māl/: [عربی]/اسم. ۱. بەکاربەری؛ بەکارهێنەری؛ خستنە گەڕ ‹از استعمال واژەهای بیگانە پرهیز کنید: لە بەکار بردنی وشەگەلی نامۆ دەس بپارێزن› ۲. کاربەری ‹این پماد ویژەی استعمال خارجی است: ئەم مەلهەمە تایبەتە بۆ کاربەری سەر پێست›.

◘ **استعمال خارجی:** کاربەری سەر پێست؛ کاربەری دەرەکی.

◘ **استعمال شدن:** بەکارچوون.

**استعمال کردن:** بەکاربردن؛ وەگەڕ خستن.

**استغاثه** / 'esteqāse، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] لالیانەوە؛ لالانەوە؛ پاڕانەوە بە گریان و شیوەنەوە.

**استغراق** / 'esteqrāq/: [عربی]/اسم. [ادبی] تێڕامان؛ تێفکرین؛ سەخت چوونە ناو بیر یان کارێکەوە.

**استغفار** / 'esteqfār، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] تۆبە؛ داوای لێبوردوویی؛ پەشیمان بوونەوە لە گوناهـ.

**استغفرالله** / 'astaqferollāh/: [عربی] دعا. پەنا بە خودا؛ پەنا بۆ خوا.

**استغنا** / 'esteqnā/: [عربی]/اسم. [ادبی] ۱. بێنیازی ۲. دەوڵەمەندی.

**استفاده** / 'estefāde، ـها/: [عربی]/اسم. کەڵک: ۱. قازانج؛ بەهرە؛ سوود ‹معاملەی قالی‌ها خوب استفاده داشت: مامەڵەی قالیەکان قازانجی باشی بوو› ۲. کار یان ڕەوتی کەڵک وەرگرتن لە شتێک ‹از این پوشالها استفاده می‌کنیم: لەم پووش و پەلاشانە کەڵک وەردەگرین› ۳. فایدە؛ کاربەری ‹یکی از استفادەهایش در کولر آبی است: یەکێ لە فایدەکانی لە کوولیری ئاویدایە›.

◘ **استفادەی ابزاری:** قازانج بردنی نابەجێ لە کەسێک یان کەسانێک.

◘ **استفاده بردن:** قازانج کردن: **استفاده کردن**

**استفاده داشتن:** بە قازانج بوون؛ بە کەڵک بوون؛ بەهرەدار بوون.

**استفاده کردن** ☜ **استفاده بردن**

**استفادەجو** / 'estefādecû، ـها؛ ـیان/: [عربی/ ترکی] صفت. خوازەڵۆک؛ بۆخۆمئەوێ.

**استفادەچی** / 'estefādečî، ـها؛ ـان/: [عربی/ ترکی] صفت. [گفتاری] بەهرەچی؛ لێهاتوو لە بە دەست هێنانی قازانجی ناڕەوادا.

**استفاضه** / 'estefāze، ـها؛ استفاضات/: [عربی] اسم. بەهرەبەری؛ کەڵک وەرگری (وەک لە خزمەت گەورەیەکدا).

**استفتا** / 'esteftā، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ڕاپرسی؛ ڕاوەرگری؛ کاری وەرگرتنی ڕا و بۆچوونی بەرپرسێکی ئایینی.

**استفتاح** / 'esteftāh/: [عربی]/اسم. سفتاح؛ هەوەڵ فرۆش؛ دەشت؛ هەوەڵ فرۆشی

ڕۆژانە.

**استفراغ** / estefrāq'/: [عربی]/اسم. ١. هێق؛ قەڵ؛ ڕەوتی ڕشانەوە؛ هەڵهاوردنەوە؛ قەی‌کردنەوە ‹بچه استفراغ کرد روی لباسم: منداڵەکە ڕشایەوە سەر لیباسەکەمدا› ٢. قەی؛ ڕشاوە؛ زێڵەشێوە؛ هەڵهاوریاگ؛ هەڵاوردە ‹استفراغ بچه ریخته بود روی لباسش: قەی منداڵەکە ڕژابووە سەر لیباسەکەیدا›.

◘ **استفراغ کردن**: ڕشانەوە؛ هەڵهاوردنەوە؛ هەڵاوردن؛ هەڵهێنانەوە؛ دەردان؛ ئاردەیوە؛ هۆر ئاردەیوە. هەروەها: **قی کردن؛ بالا آوردن؛ شکوفه کردن**

**استفسار** / estefsār'، ـات/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* پرس‌وجۆ؛ بیرخوازی؛ لێپرسی؛ کار و ڕەوتی پرسیارکردن؛ چنە پەرسەی ‹از شخص مُطّلعی استفسار کنید: لە کەسێکی ئاگادار پرس‌وجۆ بکەن›.

**استفهام** / estefhām'/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* پرسیار؛ پرس؛ خوازیاری حاڵی بوون.

**استفهامی** / estefhāmî'/: [عربی] صفت. *[دستور]* پرسیاری؛ پرس و جۆیی.

**استقامت** / esteqāmat'، ـها/: [عربی]/اسم. خۆڕاگری؛ خۆگری؛ پتەوی؛ ڕاسایی ‹استقامت ساختمان خوب است: خۆگری ماڵەکە باشە›.

◘ **استقامت بە خرج دادن** ☜ **استقامت کردن / ورزیدن**

**استقامت کردن / ورزیدن**: خۆڕاگرتن؛ ڕاوەستان؛ کۆڵ نەدان؛ ڕاسایی کردن.
هەروەها: **استقامت بەخرج دادن**

**استقبال** / esteqbāl'/: [عربی]/اسم. پێشواز؛ پێشوازی؛ بە ڕەندک؛ پیر؛ پیرایی: ١. ئاکاری بەرانبەر بە کەس یان شتێکی تازە ‹از محصول جدید چندان استقبال نشد: لە بەرهەمی نوێ ئەوندەش پێشوازی نەکرا› ٢. پێوەی؛ ڕێوڕەسمێک کە بە بۆنەی هاتنی کەسێکەوە ڕێک دەخرێ ‹مردم به استقبال ورزشکاران رفتند: خەڵکی چوونە پێشوازی وەرزشکارانەوە› ٣. دانانی شیعرێک لە سەر کێشی شیعری شاعیرێکی‌تر ٤. *[نامتداول]* داهاتوو؛ کاتی نەهاتوو.

◘ **استقبال گرم از مهمان**: پانیاز؛ بە خێرهێنانی گەرم و گوڕ؛ خۆش و بێش بە مێوان گوتن.

**استقرا** / esteqrā'، ـها/: [عربی]/اسم. *[منطق]* ڕەوتی هەڵهێنجان؛ یەکێ لە شێوەگەلی بەڵگەهێنانەوە و لێکۆڵینەوە بە پێی گەیشتن لە وردەوە بە گشت، بە واتایێکی دی، تۆژینەوەی بەش بە بەشی بابەتێک و دۆزینەوەی بڕیاری گشتی بە پێی تایبەتمەندیگەلی گشت ئەو بەشانە: **اصل استقرا**

◘ **استقرای تام**: هەڵهێنجانی تەواو؛ خوێندنەوەی تەواو.
**استقرای علمی**: هەڵهێنجانی زانستی.
**استقرای ناقص**: هەڵهێنجانی ناتەواو.

**استقرار** / esteqrār'/: [عربی]/اسم. سەقامگیری؛ سەقامگری؛ جێگری؛ کار یان ڕەوتی جێگیر بوونی کەسێ یان شتێک لە جێگایەکدا.

◘ **استقرار امنیت**: جێگیربوونی هێمنایەتی.
هەروەها: **استقرار صلح**

◘ **استقرار یافتن**: سەقامگیر بوون؛ جێگیر بوون.

**استقراض** / esteqrāz'، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کاری قەرزکردن؛ قەرز هاوردن.

**استقصا** / esteqsā'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* پەی‌دۆزی؛ بنکۆڵی؛ کار یان ڕەوتی لێکۆڵینەوە؛ تۆژینەوە؛ توێژینەوە؛ هلکەواشتن؛ هلکەوشاندن؛ هەوڵدان بۆ

دۆزینەوەی ڕەگ و ڕیشەی بابەتێک.

**استقلال** / 'esteqlāl/: [عربی] *اسم.* سەربەخۆیی؛ خۆبوویی؛ سەرازایی؛ سەربەستی؛ سقام؛ کار بە کەسێکی تر نەمان؛ دۆخ یا چۆنیەتی بڕیاردان، کار کردن و بەڕێوە بردنی کاران لە لایەن یا بە چاوەدێری کەس یا کەسانی سەربەخۆوە.

◻ **استقلال اقتصادی**: سەربەخۆیی ئابووری؛ توانای کەس یان ولاتێک بۆ کەڵک گری لە سەرچاوەگەلی ئابووری خۆ، بە شێوەی ئازاد.

**استقلال داخلی**: خودموختاری؛ سەربەخۆیی؛ ئازادی حکوومەتی ولات یان ناوچەیەک لە کاروباری دانیشتوانی خۆیدا.

**استقلال رأی**: سەربەخۆیی فیکری: **استقلال عقیده؛ استقلال فکر**

**استقلال روانی**: سەربەخۆیی ڕەوانی؛ توانی کەسێک لە پاراستنی بیر و کرداری خۆی بە شێوەی یەکدەست و یەکپارچە.

**استقلال سیاسی**: سەربەخۆیی ڕامیاری؛ سەربەخۆیی سیاسی؛ توانی بڕیاردانی دەوڵەتێک لەمەڕ کاروباری ناوخۆیی و دەرەوەیی خۆیەوە.

استقلال عقیده ☜ **استقلال رأی**

استقلال فکر ☜ **استقلال رأی**

**استقلال‌طلب** / 'esteqlāltalab، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* سەربەخۆیی‌خواز.

**استقلال‌طلبانه** / 'esteqlāltalabāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* سەربەخۆیی‌خوازانە.

**استقلال‌طلبی** / 'esteqlāltalabî/: [عربی] *اسم.* سەربەخۆیی‌خوازی.

**استکان** / 'estekān، ـها/: [روسی از فارسی؟] *اسم.* ئیستکان؛ ستەکان؛ ئیسکان؛ ئسکام؛ پیاڵە؛ پیاڵەی چا خواردنەوە.

◻ **استکان شستی**: ئیسکانی دەسکدار؛ پیاڵەی دەسەدار.

**استکان‌نعلبکی** / 'estekān.na'lbakî/: [روسی/ ؟] *اسم.* ۱. پیاڵە و ژێرپیاڵە ۲. *[مجازی]* کتری و پیاڵە؛ کتری و ئەسپاو.

**استکانی** / 'estekānî/: [روسی] ☜ گـل استکانی، **گل**

**استکبار** / 'estekbār/: [عربی] *اسم.* *[سیاست]* زۆرەملی: ۱. گووج‌کاری؛ زۆروێژی و ستەمکاری ۲. زۆرکاری؛ زۆرداری و زۆرخوازی ۳. دووری لە بەهرە مەعنەوییەکان بە هۆی پەیدا کردنی هێز و زۆرەوە ٤. *[لغوی]* لووت‌بەرزی؛ بە دەعیە و دەماری؛ دەمارزلی؛ دەماربەرزی؛ ترزلی.

**استکباری** / 'estekbārî/: [عربی] *صفت.* ۱. لووت‌بەرزانە؛ دەمارزلانە ۲. *[سیاست]* زۆرەملی؛ زۆرملانە؛ زۆرکاریانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە زۆرکاریەوە ‹سیاستهای استکباری: سیاسەتگەلی زۆرەملانە›.

**استماع** / 'estemā'/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* ۱. کار یان ڕەوتی بیستن؛ ژنەوتن؛ ژنەفتن؛ شنەفتن؛ ئژنیەی؛ بە گوێ گەیشتن ‹صداهای ناخوشی استماع می‌شد: دەنگەلێکی ناخۆش دەبیسران› ۲. گوێ لێگری؛ ڕەوتی گوێدان؛ گوێچکەدان؛ گوێ‌گرتن؛ گۆش‌دەی؛ گۆش شل‌کەردەی.

◻ **استماع شدن**: بیسران؛ شنەفتن؛ ژنەفتن؛ ئژنیەی؛ بە گوێ‌گەیشتن.

**استماع کردن**: گوێ‌دان؛ گۆش‌دای؛ گوێ لێ گرتن.

**استمالت** / 'estemālat، ـها/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* دڵنەوایی؛ کار و ڕەوتی دڵدانەوە؛ دڵداری دانەوە؛ دڵخۆشی دانەوە.

**استمداد** / 'estemdād، ـها/: [عربی] *اسم.* یارمەتی‌خوازی؛ داوای پشتگیری؛ کار یان

ڕەوتی کۆمەک ویستن؛ یاردەی واسەی.

**استمرار** / estemrār'/: [عربی]/اسم. بەردەوامی؛ پەیوەستەیی؛ سەرەمەڕە؛ دۆخ یان چۆنیەتی درێژەدار هەبوون.

▣ **استمرار داشتن:** بەردەوام بوون؛ درێژەدار بوون.

**استمراری** / estemrārî'/: [عربی] صفت. درێژەدار؛ هەمیشەیی؛ دوادار.

**استمزاج** / estemzāc'/: [عربی]/اسم. [مجازی] ژێرزوان چێژی؛ سەر داکێشی؛ کار و ڕەوتی قسە لێ کێشانەوە؛ پرسینەوە لە بیر و باوەڕی کەسێک بە تایبەت بە شێوەی ناڕاستەوخۆ.

**استمنا** / estemnā'/: [عربی]/اسم. [ادبی] ئاو هێنانەوە؛ جەلق؛ مشتە؛ مشاو؛ مشتاو؛ دەسپەڕ؛ دەسەژوو؛ دەستمێز؛ مشتەگان؛ کەپلەمە؛ بە دەست شاوەت هێنانەوە.

▣ **استمنا کردن:** مشتەکردن؛ مشتاوکردن؛ کەپلەمەکێشان.

**استمهال** / estemhāl'/: [عربی]/اسم. ماوەخوازی؛ کار یان ڕەوتی مەودا ویستن.

**استناد** / estenād'، ـها، ـات/: [عربی]/اسم. [حقوق] کار و ڕەوتی پشت بەستن یان پشت دانە بەڵگەوە ‹استناد بە این مدارک جرم را ثابت نمی‌کند: پشت‌دان بەم بەڵگانە تاوانەکە ناسەلمێنێ›.

▣ **استناد جستن/ کردن:** پشت پێ‌بەستن.

**استنباط** / estenbāt, 'estembāt'/: [عربی] اسم. بۆچوون؛ هەڵێنجان؛ هەڵهێنجان: ۱. کار یا ڕەوتی هەڵسەنگاندنی مەبەست و واتای پۆشراوەی شتێک ‹از رفتارش این طور استنباط می‌کردم کە راضی نیست: لە ئاکاری وای بۆ دەچووم کە ڕازی نیە› ۲. ئەوەی کە بەم شێوەیە هەڵسەنگێنرابێت ‹استنباط تو از این موضوع بکلّی غلط است: بۆچوونی تۆ لە بارە ی ئەم بابەتەوە بە تەوای هەڵەیە›.

**استنباطی** / estenbātî'/: [عربی] صفت. هەڵێنجانی.

**استنتاج** / estentāc'، ـها، ـات/: [عربی]/اسم. [ادبی] ئەنجامگری؛ دەرەنجامی؛ دەسکەوتی.

**استنتاجی** / estentācî'/: [عربی] صفت. دەسکەوتوویی؛ دەرەنجامیەتی.

**استنجا** / estencā'/: [عربی]/اسم. خۆ شۆردن؛ تارەت‌گرتن؛ قنگ شۆردن.

**استنساخ** / estensāx'/: [عربی]/اسم. [ادبی] لە ڕوو نووسینەوە؛ لە بەرخەت‌گرتنەوە.

▣ **استنساخ کردن:** لە ڕووەوە نووسینەوە؛ کاری لە بەرخەت‌کردنەوە.

**استنشاق** / estenšāq'/: [عربی]/اسم. [ادبی] بۆ کردن؛ هەڵمژین؛ هۆرلووشەی: ۱. کار یان ڕەوتی بۆن کردن ۲. کار یان ڕەوتی هەڵکێشانی شتێک (وەک هەڵم و بخوور) بە لووت.

**استنشاقی** / estenšāqî'/: [عربی] صفت. هەڵمژینی.

**استنطاق** / estentāq'، ـها/: [عربی]/اسم. لێ‌پرسی؛ لێوە پرسی؛ پرسینەوە؛ وەپرسی.

▣ **استنطاق کردن:** لێ‌پرسینەوە؛ پەیڤاندن؛ بە قسە هێنان؛ هەڵپێچانی بە زۆری کەسێ بۆ ئاخافتن.

**استنطاق پس دادن:** جواودانەوە؛ بەرانبەر لێوەپرسی بوونەوە.

**استنکاف** / estenkāf'/: [عربی]/اسم. [ادبی] ۱. خۆبویری؛ کار یان ڕەوتی خۆ پاراستن ‹از دریافت پول استنکاف کرد: لە وەرگرتنی پارە کە خۆی‌پاراست› ۲. سەرپێچی ‹از اجرای دستور استنکاف کرد: لە بەجێ‌هێنانی دەستوورەکە سەرپێچی کرد›.

**استوا** / estevā'/: [عربی]/اسم. ئوستوا؛ ئاو و وشکانی دەور و بەری خەتی ئوستوا.

▣ **خط استوا** ☜ **خط**

**استوائی** / 'estevā'î/: [عربی] ☜ **استوایی**

**استوار**[1] / 'ostovār، ـها؛ ـان/: اسم. [نظامی] ئوستوار؛ خاوەن دەرەجەی ئوستواری؛ پلە یەکی هێزی چەکداری ئێرانە، خوارتر لە ئەفسەری.

**استوار**[2]: صفت. پتەو؛ ڕاسا؛ هێقم؛ قایم؛ پێوەجێ؛ پاوەجا؛ خۆگرتوو؛ خۆگرتی؛ پەیت؛ داکوتیاگ ‹بنای استوار: بینای پتەو›.

**استوار**[3]: قید. ڕاسا؛ پڕ و پتەو؛ گورخ؛ قورس و قایم ‹استوار بر جای ایستاده بود: ڕاسا وەستابوو›.

**استوارنامه** / 'ostovārname، ـها/: اسم. [سیاست] بڕوانامە؛ ناسنامەیەک کە نوێنەرایەتی نێردراوێک پەسند دەکات.

**استواری** / 'ostovārî، ـها/: اسم. ۱. قایمی؛ توندی؛ پتەوی؛ گورخی؛ مەحکەمی ۲. ئوستواری؛ پلەیەکی هێزی چەکداری ئێرانە، خوارتر لە ئەفسەری.

**استوانک** / 'ostovānak، ـها/: اسم. ۱. کەپسوول ۲. سیلەندر.

**استوانه** / 'ostovāne، ـها/: اسم. گرۆڤەر؛ خەڵەڵە؛ گلیل.

**استوانه‌ای** / 'ostovāneyî/: صفت. گرۆڤەر؛ خەڵەڵە؛ خڕی لوولەیی؛ گلیل؛ گرۆڤەری لوولەیی؛ درێژۆکەی لووس و بێسووچ؛ خڕ وەک داردۆژەنگ.

**استوایی** / 'estevāyî/: [عربی] صفت. پێوەندیدار بە ئوستوا.

**استوخودوس** / 'ostoxod(d)ûs/: [معرب] ☜ **أسطُوخُودوس**

**استودان** / 'ostûdān، ـها/: اسم. [قدیمی] ئۆستوودان؛ هەستیدانک؛ گۆڕستانی زەردەشتیان؛ چاڵ و کەندێک کە ئێسک و پرووسکی مردوویان تێدەڕژاند: **سُتودان**

**استودیو** / 'estodyo، ـها/: [فرانسوی/ انگلیسی از ایتالیایی] اسم. تۆمارگە؛ ستۆدیۆ.

**استوقدوس** / 'ostoqod(d)ûs/: [معرب] ☜ **أسطُوخُودوس**

**استهزا** / 'estehzā، ـها؛ ـات/: [عربی] اسم. [ادبی] گاڵتە؛ گەمە؛ تیز؛ جەفەنگ؛ گەپجاڕ؛ تیتاڵی ‹او را به استهزا گرفته بودند: گاڵتەیان پێدەکرد›.

**استهلاک** / 'estehlāk/: [عربی] اسم. پوان؛ ڕزان؛ داڕزان؛ کار یان ڕەوتی بەرەو لە ناو چوون ڕۆیشتن (بۆ شتی بێگیان دەگوترێ، وەک کەل- پەلی ماشێن).

▣ **استهلاک بدهی**: بار بوونی قەرز؛ باربوویی قەرز.

**استهلال** / 'estehlāl/: [عربی] ☜ **بِراعَت‌استهلال**

**استیجاری** / 'estîcārî/: [عربی] صفت. کرێیی؛ کراهەیی؛ کرایەیی: ۱. بۆ کرێ ۲. کرێ؛ بەکرێدراو؛ کرێگیراو ‹خانەی استیجاری: ماڵی کراهەیی›.

**استیصال** / 'estîsāl/: [عربی] اسم. [ادبی] داماوی؛ قوڕەماوی؛ هەڕ بەسەری؛ بێدەسەڵاتی؛ پەککەوتوویی؛ لە بنهاتوویی ‹در دوران جنگ استیصال مردم به نهایت رسید: لە دەورانی شەڕدا داماوی خەڵک گەیشتە ئەوپەڕی›.

**استیضاح** / 'estîzāh/: [عربی] اسم. ۱. [نامتداول] لێپرسینەوە ۲. [سیاست] ڕوون کردنەوە؛ پرسینەوەی نوێنەری پارلمان لە وەزیر یان سەرۆکی دەوڵەت سەبارەت بە کارێک (ڕاڤە: دوای وەڵامدانەوەی ئەو کەسە، بە پرسیاری نوێنەر، پەرلمان دەبێ دەنگ بدا بەو کەسە، بە ئەرێ یان نە).

**استیفا** / 'estîfā/: [عربی] اسم. [ادبی] بەجێهێنی؛ ڕەوتی جێبەجێ کردنی کارێک بەتایبەت بەجێهێنانی ئەرکێک.

▣ **استیفای حقوق**: [حقوق] گرتنی ماف؛

داواکاری ماف.

**استیک** / 'estayk/: [انگلیسی]/اسم. ئێستەیک؛ خۆراکی گۆشتی ڕاستەی پانەوەکراوی سوورەوە بووگ: **بیفتک**

**استیل** / 'estîl/: [انگلیسی]/اسم. ۱. ئستیل؛ ئاسنی بێژەنگ ۲. /ـها/ شێوە؛ ڕەوشت ۳. شێوازی تایبەتی.

**استیلا** / 'estîlā/: [عربی]/اسم. زاڵی؛ چیری؛ دەس داگرتوویی بە مل کەسێ یان شتێکدا بە زۆر.

⊡ **استیلا یافتن**: زاڵ بوون؛ دەست بە سەراگرتن ‹انگلیسیان بر هند استیلا یافتند: ئینگلیزیەکان بە سەرهێنددا زاڵ بوون›.

**استیلن** / 'asetîlen/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] ئاسیتیلن؛ گازێکی بێ ڕەنگ، بۆدڕن، گڕی بە تیشکێکی سپی درەوشەدارەوە کە بۆ ڕۆشنایی و جۆشکاری بە کار دەبرێت.

**استیلیدن** / 'estîlîdan/: مصدر. متعدی. ساناکردنەوە؛ وەک ئەوە کە پەلەوەرێک بە دوو کەوانی پێکەوە لکاو یان دەموچاو بە جەغزێک نیشان بدرێ (لە نیگارکێشیدا): **استیلیزاسیون**

**استیلیده** / 'estîlîde/: [عربی] صفت. ساناکراوە.

**استیلیزاسیون** / 'estîlîzās(i)yon/ ☜ **استیلیدن**

**استیلیزه** / 'estîlîze/ ☜ **استیلیده**

**استیناف** / 'estînāf/: [عربی]/اسم. [حقوق] ڕەوتی تێهەڵچوونەوە؛ لە سەر گرتنەوە؛ سەر لە نوێ کردنەوە؛ دیسان لێکۆڵینەوە؛ دادڕەسی دووبارە بەرانبەر بە ڕای دادگای یەکەم.

⊡ **استیناف خواستن/ دادن**: خوازیاری دیسان لێکۆڵینەوە؛ داوای تێهەڵچوونەوە کردن.

**اسد** / 'asad/: [عربی]/اسم. ۱. ☜ **شیر ۳** ۲. [تقویم] پێنجەمین بورج لە دوازدە بورجی ساڵ، بەرامبەر بە مانگی گەلاوێژ.

⊡ **اسد اصغر** ☜ شیر کوچک، **شیر**

**اسرا** / 'osarā/: [عربی] جمعِ ☜ **اَسیر**

**اسرائیلی** [1] / 'esrā'îlî، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. ئیسرائیلی؛ جووی دانیشتووی ولاتی فەلەستین.

**اسرائیلی** [2]: صفت. ۱. جوو؛ جوولەکە؛ مووسایی ۲. سەر بە ئیسرائیل.

**اسرار** / 'asrār/: [عربی] جمعِ ☜ **سِرّ**

**اسرارآمیز** / 'asrārāmîz/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕەمزاوی؛ ڕازناک.

**اسراف** / 'esrāf، ـها/: [عربی]/اسم. زێدەڕۆیی؛ هەڵەخەرجی؛ هەرش؛ تەلاس؛ کاری هەڕژاندن؛ بێهوودە خەرج کردن؛ دەستبڵاوی نە لە جێی خۆیدا ‹اسراف در مصرف روغن ضرر دارد: زێدەڕۆیی لە ڕۆن خواردندا زیانی هەیە›.

⊡ **اسراف کردن**: زیادەڕۆیی کردن؛ هەڵەخەرجی کردن؛ بێ خۆ و بێ فایە خەرج کردن.

**اسرافکار** / 'esrāfkār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. زێدەڕۆ؛ نابەجێ خەرج کەر؛ هەڵەخەرج.

**اسرافکاری** / 'esrāfkārî، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. زێدەڕۆیی؛ هەڵەخەرجی.

**اسرع** / 'asra'/: [عربی] صفت. تونتر؛ زووتر؛ خێراتر؛ گورجتەر.

⊡ **در اسرع وقت**: لە زووترین کات؛ بە زووترین کات.

**اسطبل** / 'establ/: [معرب از لاتینی] ☜ **اِستَبل**

**اسطرلاب** / 'ostorlāb، ـها/: [معرب از یونانی] اسم. [قدیمی] ئۆسترلاب؛ ئاسمانپێو؛

ئامرازێکە لای ئەستێرەناسان بۆ لێکدانەوەی مەودای نێوان ئەستێرەکان: **أسترلاب**

**اسطقس** / 'ostoqos، ـات/: [معرب از یونانی] *اسم.* پێز؛ بنەما؛ ماک: ١. کالەدەند؛ ڕیشە و بنەچەکەی هەرشتێک ٢. هەر یەک لە ماکە چوارێنەکان (ئاو، ئاگر، با، خاک) ٣. *[کنایی]* پێ، بنەڕەت؛ بنچینە؛ پایە؛ بناخە؛ شەنگەستە ❊ **أسّ و قُس** *[گفتاری]*

**اسطوخودوس** / 'ostoxod(d)ûs، ـها/: [معرب از یونانی] *اسم.* شاڕێحانە؛ شاڕێحانە ڕۆمی؛ ئەسپەرە ڕۆمی؛ خەزێمە کێویلە: **استوخودوس؛ استوقدوس**

**اسطوره** / 'ostûre، ـها؛ أساطیر/: [عربی از سریانی] *اسم.* دیرۆک؛ ئەفسانەیەک سەبارەت بە بوونەوەران، کار یان ڕووداوانی نائاسایی، برێ لە بیر و بڕوای خەلکی کەونارا لەبارەی دیاردەگەلی سروشتی یان مێژووییەوە (وەک بەدیهاتنی جیهان، گیانەوەران، ڕووەکان، کێوان، چۆمان، گەلان، نەتەوە و ولاتان).

**اسف** / 'asaf/: [عربی] *اسم. [ادبی]* خەفەت؛ دەرد و داخ: ١. هایلۆ؛ کول و زووخاو؛ خەم و کەسەر؛ جەخار ‹کسالت ابوی موجب اندوه و اسف گردید: نەخۆشینی باوکم بووە هۆی خەم و خەفەتێکی زۆر› ٢. دەردۆ؛ مخابن؛ داخ؛ ئاخ؛ توخوا؛ دوخان.

◘ **اسف خوردن:** داخ و خەم خواردن؛ ئاخ هەلکێشان ‹همە بر مرگ آن جوان اسف خوردند: هەموو بۆ ئەو جوانەمەرگە ئاخیان هەلکیشا›.

**اسف‌آور** / 'asafāvar/: [عربی/ فارسی] *صفت.* خەماندەر؛ خەمهێنەر.

**اسفار** / 'asfār/: [عربی] *اسم.* ١. جمعِ ☜ **سِفر** ٢. *[نامتداول]* جمعِ ☜ **سَفَر**

◘ **اسفار خمسه:** پێنج کتێبی هەوەلی دەورەی عەتیق.

**اسفالت** / 'esfālt/: [فرانسوی] ☜ **آسفالت**

**اسف‌انگیز** / 'asafangîz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ناخۆش؛ خەماوەر؛ کەسەردەر؛ داخدەر؛ هۆی هەلخێزانی هەستی ناخۆش ‹همە از این رویداد اسف‌انگیز غمگین شدند: هەموو لەم ڕووداوە ناخۆشە داگیران›.

**اسفبار** / 'asafbār/: [عربی/ فارسی] *صفت.* خەمناک؛ ناخۆش.

**اسفرزه** / 'esfarze، ـها/: *اسم.* ڕکێشە؛ ڕەکێشە؛ گیا سنگ‌ئێشە؛ ئەسپرزە؛ یاوز؛ گەلا دمەل: **اسپغول**

**اسفرومتر** / 'esferometr، ـها/: [لاتینی] *اسم.* ئێسفیرومیتر؛ دەزگایەک بۆ ڕێک ئەندازە گرتنی ئەستوورایی شتی چکۆلە یان خڕووکە.

**اسفل** / 'asfal، اسافل/: [عربی] *صفت. [ادبی]* خوارتر؛ وارتەر؛ وارین.

◘ **اسفل سافلین:** ١. چالتر یان خوارتر لە هەموو ٢. خوارترین چال لە تەواوی چالەکانی جەهەندەمدا.

**اسفناج** / 'esfenāc، ـها/: [از یونانی] *اسم.* سپناخ؛ ئەسپەناخ؛ ئەسپەناغ؛ ئەسفەناج؛ سپەناغ؛ سپیناغ؛ گیایەکە دەیچێنن و لە ئاشپەزیدا بە کاری دێنن.

**اسفناک** / 'asafnāk/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ناخۆش؛ خەماوەر.

**اسفنج** / 'esfanc، ـها/: [معرب از یونانی] *اسم.* هەور؛ سونگەر؛ هەوری؛ کەرەور؛ ئیسفەنج؛ شتێکی نەرمی کون‌کونە بۆ دۆشەک، سەرین، سەندەلی، ماشین و... بە کار دەبرێ.

◘ **اسفنج حمام:** لیفە؛ لفکە؛ هەور؛ هەوری حەمام.

**اسفنجی** / 'esfancî/: [معرب] *صفت.* هەوری؛ هەورینە؛ هەورین ‹تشک اسفنجی: دۆشەکەی

هەوری›.

**اسفند** / 'esfand/: /اسم/ ۱. ڕەشمەمە؛ سێهەمین مانگی زستان؛ مانگی دوازدەهەمی ساڵی ئێرانی ۲. /ـها/ قانگ؛ دیدی؛ ئەسپەن؛ ئسبەن؛ ئەسپەندەر ۳. /ـها/ دیدی؛ تووی ئەسپەندەر ❊ **اسپند**

▣ **اسفند دود کردن:** قانگ سووتانن؛ ئەسپەندەر سووتاندن.

**اسفنددانه** / 'esfand.dāne، ـها/: /اسم/ دانە ئەسپەندەر؛ دانە قانگ؛ دەنکی ئەسپەندەر: **اسپنددانه**

**اسقاط** [1] / 'esqāt/: [عربی] /اسم/ ۱. کار یان ڕەوتی خستن؛ وسەی؛ لە بار بردن ‹اسقاط جَنین: خستنی پز› ۲. دەس‌کۆتایی؛ ڕەوتی داکەوتن، لە بەین چوون یان بێبەش بوون ‹اسقاط کلّیەی خیارات: دەس‌کۆتایی لە هەموو دەستەڵاتێک›.

**اسقاط** [2]: *صفت*. دەس‌کۆتا؛ داکەوتە؛ بێبەش.

**اسقاطی** / 'esqātî/: [از عربی] *صفت*. چەکڵە: ۱. لە کار کەفتی؛ خراپ و لە کار کەوتوو ۲. بۆ فڕێدان؛ بێ‌کەڵک.

**اسقف** / 'osqof، ـها؛ ـان/: [معرب از یونانی] /اسم/ ئوسقۆف؛ پایە یێکی کلێسایی بالاتر لە کەشە.

▣ **اسقف اعظم:** ئوسقۆفی گەورە؛ سەر ئوسقۆف.

**اسکات** / 'eskāt/: [عربی] /اسم/ [ادبی] دەمکوت؛ کار یان ڕەوتی بێدەنگ کردن؛ نق برین ‹اسکات مخالفان: دەمکوتی نەیاران›.

**اسکاتیف** / 'eskātîf/ ☜ روغن اسکاتیف، **روغن**

**اسکاچ** / 'eskāč/: [انگلیسی] /اسم/ ئیسکاچ؛ کاسەشۆر؛ دەفرشۆر؛ پەرپەژمینە؛ زروە؛ پەڕۆ زروە.

**اسکادران** / 'eskādrān، ـها/: [فرانسوی از ایتالیایی] /اسم/ [نظامی] سکادران؛ هێزی چەکداری هەوایی.

**اسکان** / 'eskān/: [عربی] /اسم/ نیشتەجێیی؛ هێور؛ ئاکنجی؛ کار یان ڕەوتی نیشتەجێ بوون ‹اسکان عشایر: نیشتەجێیی کۆچەران›.

▣ **اسکان دادن:** نیشتەجێ کردن؛ جێگە پێدان؛ هێوراندن؛ دامەزراندن؛ یاگەدەی؛ مەرزنایرە ‹زلزلە زدگان را در چادرها اسکان دادند: بوومەلەرزە لێداوەکانیان لە نێو چادردا نیشتەجێ کرد›.

**اسکان یافتن:** نیشتەجێ بوون؛ جێ پەیدا کردن؛ ئاکنجی بوون؛ مانەوە؛ ئەرەمەنەی؛ دامەزران؛ مەرزیایرە.

**اسکاندیم** / 'eskāndiyom/: [فرانسوی از انگلیسی] /اسم/ سکاندیۆم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ۲۱ و کێشی ئەتومی ٤٤,٩٥.

**اسکاندیناویائی** / 'eskāndînāv(i)yā'î/ ☜ **اسکاندیناویایی**

**اسکاندیناویایی** / 'eskāndînāv(i)yāyî/: /اسم/ سکاندیناویایی: ۱. /ـها؛ ـان/ هەر یەک لە نیشتەجێیانی سکاندیناوی یان منداڵەکانیان ۲. شاخەیەک لە زمانگەلی ژێرگرووپی ژێرمەن کە بریتین لە سوێدی، نۆرڤێژی، دانمارکی و ئایسلەندی: **اسکاندیناوائی**

**اسکان‌یافتگی** / 'eskānyāftegî/: [عربی/ فارسی] /اسم/ [جامعه‌شناسی] نیشتەجێیی؛ نیشتەجێیەتی؛ نیشتەجێتی؛ شێوازێک لە ژیانی کۆمەڵایەتی کە تاکەکانی کۆمەڵگا لە شوێنێکی دیاریکراو (وەک شار یان دێ) نیشتەجێ بن. بەرانبەر: **کوچندگی**

**اسکان‌یافته** / 'eskānyāfte، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *صفت*. نیشتەجێ؛ هێوراو؛ خاوەن دۆخ یان چۆنیەتی نیشتەجێ بوون.

بـەرانبـەر: **کوچنـدە** ‹عـشایر اسـکان‌یافتـە: کۆچەرانی نیشتەجی›.

**اسـکریم** / esk(e)rîm'/: [فرانـسوی] /اسـم. */ورزش/* شمشێربازی؛ کایەی شمشێر.

**اسـکلت** / eskelet'، ـهـا/: [فرانـسوی] /اسـم. ۱. چوارچێـوە؛ کـەلـەخ؛ کـەلـەسـتە؛ قـاپۆرە؛ قابـڵۆخە؛ قاپـڵۆخ؛ دەنێـودۆواڵ؛ قراپـووە ۲. ئێسقان‌بەندی؛ چواربەندە.

**اسـکلت‌بنـدی** / eskeletbandî'، ـهـا/: [فرانـسوی/ فارسـی] /اسـم. ۱. */بنـایی/* سـفت‌کـاری ۲. کـار یـا ڕەوتی دروسـت‌کـردن و پێـوە لکاندنی برگەگەلی بنـەمـایی مـاڵ، خـانووبـەرە یان دەزگایەک * **اسکلت‌سازی**

**اسـکلت‌سـازی** / eskeletsāzî'، ـهـا/: [فرانـسوی/ فارسی] /اسم. ۱. ☜ **اسـکلت بنـدی** ۲. کـار یـان ڕەوتی دروسـت‌کـردنی ئێـسقان‌بـەنـدی گیانلەبـەران وەک خـۆی بـۆ پیـشاندان یـان بـۆ فێرکاری.

**اسـکلروز** / eskeleroz'/: [انگلیـسی] /اسـم. */پزشـکی/* ڕەوتی ڕەق بـوون؛ پتـەو بـوون؛ سفتەوە بوون.

**اسـکله** / eskele'، ـهـا/: [معـرب از ایتالیـایی] /اسـم. لەنگـەرگـا؛ لـەنگـەرگـە؛ ئـەسـکەلـە؛ بـەنـدەر؛ دامـەزراوەیـەک لـە قـەراخـی دەریـا بـۆ کـار و باری گەمیە.

**اسـکناس** / eskenās'، ـهـا/: [روسـی از فرانـسوی] /اسم. ئەسکەناس؛ پووڵو پارەی لە قاغەز.

**اسـکنبیل** / eskanbîl'/: [؟] /اسـم. ڕێواسـە؛ ڕیڤاسە؛ ڕوەک یـان دارچکێکـی خۆڕسـکە کـە لاسکی زۆر و گەڵای کەمی هەیە.

**اسـکندان** / eskandān'، ـهـا/: /اسـم. */نامتـداول/* کونی کلیل.

**اسـکندرانی** / eskandarānî'/: صـفت. ئـەسـکەنـدەرانی؛ پێـوەندیـدار یـان سـەر بـە شاری ئەسکەندەرییە لە میسردا.

**اسـکنه** / eskene'، ـهـا/: /اسـم. */نجـاری/* ئـەسـکەنـە؛ مغـار؛ موغـار؛ تیخـی‌نـەجـاران؛ ئامرازێکی دارکۆڵینی دارتاشانە.

**اسـکواش** / eskovāš'/: [انگلیـسی] /اسـم. */ورزش/* سـکواش؛ یاریـیـەکی دوو یـان چـوار کەسییە، وەک تێنیس.

**اسـکوتر** / eskoter'/: [انگلیـسی] /اسـم. ملـهوور؛ ملـهور؛ جۆرێـک سـۆنەی قـەڵـەوی دەنـدووک زلە.

**اسـکوتوم** / eskotom'/: [؟] /اسـم. */پزشـکی/* سکۆتۆم؛ بە دیهـاتنی خاڵـێکی کـوێر (ڕە ش) لـە مەیدانی دیتندا.

**اسـکودو** / eskodo'/: [؟] /اسـم. سـکۆدۆ؛ پارەی وڵاتی پورتوغاڵ.

**اسـکورت** / eskort'/: [فرانـسوی] /اسـم. ۱. ڕوانە؛ بـەدرەقـە؛ کـار یـان ڕەوتی بـەڕێ کـردن ‹خانم را تـا در خانـه‌اش اسـکورت کـرد: خانمـەکـەی تـا دەرکـی مـاڵ ڕوانـە کـرد› ۲. ئاگـاداری؛ چـاوەدێـری ‹کارشـان اسـکورت آقاسـت: کاریـان چـاوەدێـری لـە ئاغایـە› ۳. /ـهـا/ پێـشمەرگـە؛ پارێزەر؛ پارێزگار؛ کـەس یـان گرۆیێـک کـە بـۆ ئاگـاداری یـان چـاوەدێـری لـە کـەسـێکەوە هاوڕێی دەکەن ‹سـه نفـر اسـکورت آقـا بودنـد: سـێ کەس پاریزەری ئاغا بوون›.

**اسـکی** / eskî'/: [فرانـسوی از نـروژی] /اسـم. ۱. خلیـسکانێ؛ خلیـسکێن؛ خـسکێ؛ خـلـۆوزگێ؛ خش‌خشان؛ خـزخـزان؛ وەرزشـی خـز خـواردن بە سەر بەفردا ۲. /ـها/ ئامرازی خلیسکانێ.

▣ **اسکی ترکه‌ای**: کـەوانـە؛ لاکـان؛ تـەنراوێکـە لـە تـووڵ دکرێتـە پـاوە بـۆ بـە سـەر بـەفـردا ڕۆیشتن.

**اسکی روی آب**: خلیسکانی سەر ئاو.

**چوب اسکی** ☜ **اسکی ـ۲**

**اسـکی‌بـاز** / eskîbāz'، ـهـا؛ ـان/: [فرانـسوی/ فارسـی] /اسـم. شـەمتـۆک؛ کاشـکان؛ کاشـیکان؛

کەسێ کە وازی لە خلیسکێنە. هەروەها: **اسکی‌بازی**

**اسکیت** / 'eskeyt، ـها/: [انگلیسی]/اسم. سکەیت؛ کەرەسەیەکی وەرزشی چەرخدارە کە دەیبەسنە ژێر کەوشەوە و پێی دەڕۆن.

**اسکیزوفرنی** / 'eskîzof(e)renî، ـها/: [فرانسوی از آلمانی]/اسم. سکیزۆفێرنی؛ تێکچوونی ڕەوانی درێژخایەن بە شێوەی دابڕان لە کۆمەڵ: **شیزوفرنی؛ جنون جوانی**

**اسکیمو** / 'eskîmo/: [فرانسوی]/اسم. سکیموو: ١. هۆزی نیشتەجێی باکووری کانادا، ئالاسکا، گرۆنلەند و ڕۆژهەلاتی سیبری، بە ڕەنگی پێستی قاوەیی ڕۆشن، ڕوومەتی پان و چاوی چکۆلەوە ٢. /ـها/ هەرکام لە کەسانی ئەو هۆزە.

**اسلاف** / aslāf/: [عربی]/اسم. ١. جمعِ ☜ **سَلَف** ٢. باب و کالان؛ با و باپیر ٣. پێشینیان؛ پێشینان؛ کەسانێک کە بەرلە کەسان یان تاقمێکی‌تر ژیاون ‹غزنویان اسلاف سلجوقیان بودند: غەزنەویگەل پێشینیانی سەلجووقیەکان بوون›.

**اسلام** / 'eslām/: [عربی]/اسم. ئیسلام؛ دینی حەزرەتی موحەممەد؛ لە دینە تاکە پەرەستیەکانە: **دین اسلام**

**اسلامبولی** / 'eslāmbolî / ☜ **استانبُولی** [2]

**اسلامخواه** / 'eslāmxāh/: [عربی/ فارسی] ☜ **اسلامگرا**

**اسلامخواهی** / 'eslāmxāhî/: [عربی/ فارسی] ☜ **اسلام‌گرایی**

**اسلام‌شناس** / 'eslāmšenās، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئیسلامناس؛ کەسێ کە سەبارەت بە دینی ئیسلام و فەرهەنگی ئیسلامی زانیاری و ئاگەداری هەیە.

**اسلام‌شناسی** / 'eslāmšenāsî/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئیسلامناسی؛ زانستی سەبارەت بە دین و مێژووی ئیسلام.

**اسلامگرا**[1] / 'eslāmgerā، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئیسلامەوگر؛ ئیسلامخواز؛ کەسێ کە بیر و باوەڕی بە ئیسلامە و لایەنگریەتی: **اسلامخواه**

**اسلامگرا**[2]: صفت. ئیسلامخواز: **اسلامخواه**

**اسلام‌گرایی** / 'eslāmgerāyî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئیسلامەوگری؛ ئیسلامخوازی: **اسلامخواهی**

**اسلامی** / 'eslāmî/: [عربی] صفت. ئیسلامی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە ئیسلامەوە ٢. *[گفتاری]* موسڵمان.

**اسلامیت** / 'eslāmîyyat/: [عربی]/اسم. موسوڵمانی.

**اسلاو** / 'eslāv/:/اسم. ئسلاو؛ ئسلاڤ: ١. هەرکام لە کەسانی سەر بە هۆزانی جۆراوجۆری سپی‌پێست لە ئورووپای ڕۆژهەلات، بریتی لە رووس و بولغار و سربوکرۆڤات و لەهستانی و مۆلداو ٢. دەستەیەک لە زمانەکانی هێندو ئورووپایی (ڕووسی، ئۆکراینی، سیربوکۆروڤات، چێکی، سلۆڤاکی، سلۆڤێنی و لەهێستانی).

**اسلحه** / 'aslahe، اسلحه؛ تسلیحات/: [عربی]/اسم. ١. جمعِ ☜ **سِلاح** ٢. چەک؛ ئامرازی شەڕ.

▣ **اسلحەی اجتماعی**: چەکی چەندکەسی؛ چەکی جڤاتی؛ چەکێک کە بۆ کارپێکردنی بە زیاتر لە تاقەکەسێک نیازە: **جنگ‌افزار اجتماعی**

**اسلحەی انفرادی**: چەکی تاکەکەسی؛ چەکێک کە تەنیا کەسێک بتوانێ بە کاری بەرێ.

**اسلحەی خودکار**: چەکی ئوتۆماتیک؛ چەکی خۆمەش؛ چەکی وا کە دوای کەوتنە کار، بۆ خۆی یەک لە دووی یەک

گولله بێنێته‌وه به‌ر کار، یان به ڕێژنه تیر بهاوێ.

**اسلحه‌ی سبک:** چه‌کی سووک (وه‌ک تفه‌نگ و ده‌مانچه): **جنگ‌افزار سبک**

**اسلحه‌ی سرد:** چه‌کی سارد (وه‌ک کارد و شیر و خه‌نجه‌ر).

**اسلحه‌ی سنگین:** چه‌کی قورس (وه‌ک تۆپ و شه‌ستیر).

**اسلحه‌ی شکاری:** چه‌کی ڕاو.

**اسلحه‌ی کمری:** ده‌مانچه؛ چه‌کی که‌مه‌ری.

**اسلحه‌ی گرم:** چه‌کی گه‌رم؛ چه‌کی وا که ماکی ته‌قێنه‌ری تێدا به کار دێنن.

▣ **اسلحه برداشتن:** چه‌ک هه‌ڵگرتن؛ ده‌س به چه‌ک بوون.

**اسلحه بستن:** چه‌ک پێ‌بوون؛ چه‌کدار بوون.

**اسلحه را (به) زمین گذاشتن:** *[کنایی]* چه‌ک دانان؛ ده‌س له شه‌ڕ کێشان.

**اسلحه کشیدن:** نیشتنه پارێز؛ چه‌ک کێشان؛ ده‌س بۆ چه‌ک بردن.

**اسلحه‌خانه** / aslahexāne' ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. جبه‌خانه؛ جێگایه‌ک که ئامرازی شه‌ڕی تێدا هه‌ڵده‌گرن.

**اسلحه‌دار** / aslahedār' ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. چه‌کدار؛ به‌رپرسی جبه‌خانه.

**اسلحه‌سازی** / aslahesāzî'/: [عربی/ فارسی] /اسم. چه‌کسازی: ۱. /ـها/ کارخانه‌ی چه‌کسازی ۲. /ـها/ کارگه‌ی دروست کردنه‌وه‌ی چه‌ک ۳. کاری دروست‌کردن و دروست‌کردنه‌وه‌ی چه‌ک.

**اسلواک** / eslovāk'/:/اسم. سلۆڤاک: ۱. خێڵێ له سلاڤه‌کانی ڕۆژاوا؛ نیشته‌جێی ولاتی سلۆڤاکی ۲. زمانی ئه‌و خێڵه ۳. /ـها/ هه‌رکام له خه‌ڵکانی سه‌ر به ولاتی سلۆڤاکی یان زارۆکانیان.

**اسلوب** / uslûb, 'oslûb' ، ـها/: [عربی]/اسم. شێواز؛ شێوه؛ ڕێگه؛ ڕه‌وشت؛ زێ.

**اسلوموشن** / eslo:mo:šen'/: [انگلیسی]/اسم. سلومۆشێن؛ نیشاندانی فیلم به شێوه‌ی هێواش و خاو.

**اسلون** / esloven'/:/اسم. سلۆڤێن: ۱. هه‌رکام له خه‌ڵکی خێڵی سلاڤه باشووریه‌کان که زۆرتر له‌گه‌ڵ سیربه‌کان و کرۆواته‌کان ده‌سته‌به‌ندی ده‌کرێن ۲. /ـها/ خه‌ڵکی سلۆڤێنیا ۳. زمانی ئه‌و خه‌ڵکه، له زمانگه‌لی سلاڤی.

**اسلیمی** / eslîmî' ، ـها/: [از عربی]/اسم. ئیسلیمی؛ شێوازێک له هونه‌رگه‌لی جوانکاری، به شێوه‌ی گوڵ و بته‌ی پێچاوپێچ.

**اسم** / esm' ، ـها؛ أسامی؛ أسما/: [عربی]/اسم. ناو؛ نێو؛ نامه؛ نووم؛ ناق؛ نوومه؛ نامێ: ۱. *[گفتاری]* وشه‌یه‌ک بۆ نیشان کردنی که‌سێک یان شتێک ۲. *[دستور]* وشه‌یه‌ک جگه له جێناو که ده‌بێته بکرد یان به‌رکار، یا دۆخ یان چۆنیه‌تیه‌ک ده‌رده‌خا.

▣ **اسم اشاره:** *[دستور]* ناوی ئاماژه؛ «این» (ئه‌مه؛ ئینه) یا «آن» (ئه‌وه؛ ئانه)، کاتێ که جێی ناو ده‌گرێته‌وه و بۆ ئاماژه به نزیک یان دووره.

**اسم اعظم:** به‌رزترین ناو؛ ناوی خودا؛ به‌رزترین ناوی خودا که ده‌بێژن ته‌نیا به‌نده‌گه‌لی هه‌ڵبژێرداوی خۆی ده‌یزانن.

**اسم بی‌مسما:** ناوی بێ‌ناوک؛ ناوی بێ‌ناوه‌رۆک؛ ناوێک که له‌گه‌ڵ خاوه‌نه‌که‌یدا یه‌ک ناگرنه‌وه (وه‌ک ناوی چاوشین بۆ کوێر و قژزێڕین بۆ که‌چه‌ڵ).

**اسم جامد:** *[دستور]* ناوی بێ‌ڕه‌گ؛ ناوێک که له وشه‌یه‌کی تره‌وه نه‌گیردرابێت (وه‌ک

سەر، کێو).

**اسم جمع:** *[دستور]* ناوی کۆ؛ ناوێک کە بە شێوازی تاکە و لە واتادا کۆ دەگەیێنێت (وەک دەستە، کۆمە، گەل).

**اسم جنس:** *[دستور]* هەڤەناف؛ ناوی گشتی؛ ناوێک کە هەموو شتی ڕەگەزی خۆی دەگرێتەوە، بە بێ لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندیگەلیان (وەک مرۆ، باڵندە، گیاندار): **اسم عام**

**اسم خاص:** *[دستور]* ناوی تایبەتی؛ ناوێک کە نیشانەی کەس یان شوێنێکی تایبەتە (وەک کاوە، شاهۆ): **اسم عَلَم**

**اسم ذات:** *[دستور]* ناوی سەربەخۆ؛ ناوی شتێ کە هەبوونی بە شتێ‌ترەوە نەبەستراوە (وەک لەش، ماڵ، کتێو). بەرانبەر: **اسم معنی**

**اسم زمان:** *[دستور]* ناوی کات؛ ناوێک کە نیشانەی ماوە یان ساتێکی دیاریکراوە (وەک شەو، ڕۆژ، بەیانی، حەفتە، مانگ، ساڵ).

**اسم شب:** *[قدیمی]* وتە یان ناوێک لە پێشەوە بڕیاردراو بۆ هاتوچوو بەو شوێنانەدا کە لە ژێر چاوەدێریدان.

**اسم عام** ☜ **اسم جنس**

**اسم عَلَم** ☜ **اسم خاص**

**اسم فاعل:** *[دستور]* ناوی بکرد؛ ناوی کارکەر یان خاوەنی دۆخێک کە زۆرتر هاوبەشی نێوان ناو و ئاوەڵناوە (وەک ترسێنەر، ئامۆژگار).

**اسم فامیل:** نێوی بنەماڵەیی؛ نێوی بنەماڵە؛ نێوی خێزانی؛ ناڤی ویجاخێ.

**اسم مرکّب:** *[دستور]* ناوی لێکدراو؛ ناوی تێکەڵ؛ ناوێک کە لە دوو یان چەند وشە پێکهاتووە، (وەک شب‌بو: شەوبۆ، لە «شەو» و «بۆ»).

**اسم مستعار:** نازناو؛ ناوی هەڵبەست؛ ناوێکی دروستکراو کە کەسێک (بەتایبەت نووسەر یان شاعیرێک) بۆ خۆی هەڵیدەبژێرێ.

**اسم مصدر:** *[دستور]* ناوی چاوگ؛ ناوێ کە واتای کار نیشان دەدات (وەک بڕشت، کۆشش، کەنشت).

**اسم معرفه:** *[دستور]* ناوی ناسراو؛ ناوی بناس؛ ناوێ کە بیسەر خاوەنەکەی دەناسێت.

**اسم معنی:** *[دستور]* ناوی واتا؛ ناوێک کە بوونی بەسراوە بە شتێکی‌ترەوە (وەک هۆش، جوانی). بەرانبەر: **اسم ذات**

**اسم مفعول:** *[دستور]* ناوی بەرکار؛ ناوێ کە بە خاوەنەکەی دۆخی بەرکاری دەدات و زۆرتر هاوبەشی نێوان ناو و ئاوەڵناوە (وەک سووتاو، خەوتوو؛ چەماوە).

**اسم مکان:** *[دستور]* ناوی شوێن؛ ناڤێ جهێ؛ ناوێ کە جێگایێک نیشان دەدات (وەک هەوارگە، بەردەلان، کوێستان، گەرمیان، بەردانی، دەشتایی و...).

**اسم نکره:** *[دستور]* ناوی نەناسراو؛ ناڤێ نەنیاس؛ ناوێ کە بیسەر خاوەنەکەی ناناسێت.

▣ **اسم بد درکردن:** *[گفتاری]* بە خراپە ناو داخستن؛ بێ‌ناف بوون؛ ناو بە خراو دەرچوون؛ ناو زڕیان: **اسم کسی بد در رفتن**

**اسم بردن:** ناو بردن؛ ناو گوتن؛ نامبەر کردن؛ نامێ بەردەی؛ ناڤبرن.

**اسم چیزی این بودن:** گوایە؛ گوا؛ ئەڵێن؛ ئەیژن؛ لە ڕواڵەتا وا پیشان دان ‹اسمش این است کە عروسی گرفتەایم: گوایە گوڤەندمان گرتووە›.

**اسم خود را عوض کردن:** *[مجازی]*

سمێڵی خۆ تاشین؛ دان نان بە نەزانی یا شکستی خۆدا ‹اگر حرف تو ثابت شود من اسمم را عوض می‌کنم: ئەگەر قسەکەی تۆ بێتەدی من سمیلی خوم ددتاشم›.

**اسم درکردن:** /گفتاری/ نێو داخستن؛ ناو دەرکردن؛ ناڤ و بانگ چوون.

**اسم روی کسی گذاشتن:** /مجازی/ ناو بڕین بەسەر کەسێکدا؛ نیتکە نان بە کەسێکەوە؛ پیتکە پیا خستن؛ ناونیتکە نان بە کەسێکەوە؛ ناوی خراپە نان بە کەسێکەوە.

**اسم کسی بد در رفتن** ☜ **اسم بد درکردن**

**اسم کسی/ چیزی را آوردن:** ناو بردنی شتێ/ کەسێ ‹هر روز اسمش را می‌آورد: هەموو ڕۆژێ ناوی دینی›.

**اسم کسی را روی سنگ کندن:** /مجازی/ کۆچی دوایی‌کردن؛ مردن.

**اسم نوشتن** ☜ **نامنویسی**

**به اسم خود جا زدن:** کردنە هی خۆ؛ بە درۆ بە خۆوە لکاندن.

**به اسم کسی کردن:** کردنە ناو کەسێکەوە؛ بە ناوی کەسێکەوە کردن ‹خانه را به اسم زنش کرد: خانووەکەی کردە ناو ژنەکەیەوە›.

**اسما** / asmā'/: [عربی] جمعِ ☜ **اسم**

**اسماً** / esman'/: [عربی] قید. بەناو؛ بەنامێ؛ بناڤ: ۱. لەڕووی ناوەوە ‹او را اسماً می‌شناختم، ولی ندیده بودم: بە ناوەوە دەمناسی، بەلام نەمدیبوو› ۲. بە ڕواڵەت ‹اسماً نوکر بود و رسما ارباب: بەناو نۆکەر بوو، لە ڕاستیدا ئاغا›.

**اسماعیلی** / esmā'îlî'/: [عربی] صفت. ئیسمائیلی؛ حەوت ئیمامە؛ پەیڕەوی مەزەبی ئیسمائیلی: **هفت‌امامی**

**اسماعیلیه** / esmā'îlîyye'/: [عربی]/اسم. ئیسماعیلیە؛ مەزەوی شیعەی حەوت ئیمامی کە ئیسماعیل کوڕی ئیمام جافر بە ئاخر ئیمام دەزانن.

**اسمبلی** / asemblî'/: /اسم. ئەسەمبلی؛ لە زمانەکانی بەرنامەنووسی کۆمپیوتەر.

**اسم‌گذاری** / esmgozārî'/: [عربی/ فارسی] ☜ **نامگذاری**

**اسم‌نویسی** / esmnevîsî'/: [عربی/ فارسی] ☜ **نامنویسی**

**اسم و رسم** / esm-o-rasm'، ـها/: [عربی] اسم. /گفتاری/ /مجازی/ ۱. ناو و نیشان؛ چۆناوچۆنی حاڵ و باڵ ۲. ناوبانگ؛ ناو و دەنگ؛ ناوداری و ناسراوی.

▣ **اسم و رسم درکردن:** ناوبانگ داخستن؛ ناو و نیشان دەرکردن؛ بەناوبانگ بوون.

**اسم‌ورسم‌دار** / esm-o-rasmdār'، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. ناو و نیشاندار؛ ناسراو؛ بەناوبانگ.

**اسموکینگ** / esmokîng'، ـها/: [فرانسوی] /اسم. سمۆکینگ؛ جل و بەرگی ڕەسمی پیاوانە کە ڕەشە و کەواکەی بێ کلانەیە، لە پێشەوە کول و لە دواوە درێژە، پانتۆڵەکەشی تەسکۆڵەیە، زۆرتر بە کوڵەجەوە لە بەری دەکەن.

**اسمی** / esmî'/: [عربی] صفت. ۱. /مجازی/ ڕواڵەتی ‹مدیراسمی: بەرپرسی ڕواڵەتی› ۲. /گفتاری/ ناودار؛ ناسراو؛ بەناو ‹کدخدا حسین از آدمهای اسمی محله بود: کوێخا حوسەین لە پیاوە ناودارەکانی گەڕەک بوو›.

**اسمیم** / osmiyom'/: [فرانسوی]/اسم. ئۆسمیۆم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی سەخت، بە ژمارەی ئەتومی ۷٦ و کێشی ئەتومی ۱۹۰,۲.

**اسناد** / asnād'/: [عربی] جمعِ ☜ **سَنَد**

**اسناد** / esnād'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. وە پاڵدراوی؛ پێوە لکاوی؛ هاوگەری.

▣ **اسناد دادن:** دانە پاڵ؛ پێوەلکاندن؛ کار یان قسەیەک دانە پاڵ کەسێک یان شتێکەوە.

**اسنومبیل** / 'esnomobîl/: [انگلیسی] ☜ **برفرُو**

**اس‌وقس** / 'oss-o-qos/: [معرب از یونانی] ☜ **أسطُقس**

**اسوه** / 'osve، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] ۱. پێشەنگ؛ نمانا؛ ڕێنما؛ سەرمەشق؛ گرۆبەر؛ نموونەی بێ‌خەوش ۲. [نامتداول] ڕێبەر؛ پێشەوا.

**اسهال** / 'eshāl، ـها/: [عربی]/اسم. سکەشۆرە؛ سکەشۆرێ؛ ئشکەم؛ بەلەفێرە؛ تەقەفێرە؛ قەقەفێرە؛ تەقەتوورە؛ تەقەتوورکە؛ ئیسهاڵ؛ گووشە؛ دەروی؛ دەڕاوێ؛ ڤزۆ؛ زەحیر؛ زەختە؛ تراڵێ؛ فیقە؛ ڤرک؛ نەخۆشینی هناڤ چوون؛ تەڤزین؛ فێران؛ زگ‌ڕۆیین؛ فێرکان؛ دڵ/ زگ/ پا کارکردن؛ هەڵتووران؛ فێریان؛ زکچوون؛ هەڵشوولان؛ سکچوون؛ سکرۆیین؛ شاتان؛ زگ‌ڕەوانی؛ سەرپێیی.

▣ **اسهال خونی:** سکەشۆرەی خوێنی؛ زکچوونا خوێنی؛ نیشتەرەی.

**اسهال دام:** تووڕاندن؛ فێراندن؛ تڕووشقە؛ زگ‌چوونی مالات.

**اسهالی** / 'eshālî، ـها/: [عربی] صفت. زگەشۆرە؛ زگ چوونی؛ بەلەفیرە؛ تڕووشقانێ؛ زگەشۆرەوار؛ تووشی زگەشۆرە هاتوو.

**اسید** / 'asîd، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] ترش؛ ئاسیل؛ تیزاو؛ هەر ماکێکی کیمیایی کە لە ئاودا $H^+$ بەدی بێنێ.

**اسیدخونی** / 'asîdxûnî/: [فرانسوی/ فارسی] اسم. [پزشکی] ترشی خوێنی؛ ترش بوونی نائاسایی خوێن وا کە $H^+$ زۆر دەبێ و PHی خوێن کەمتر لە حاڵی ئاسایی دەبێتەوە.

**اسیدی** / 'asîdî، ـها/: [فرانسوی] صفت. ترشی؛ ترشی‌دار. هەروەها: **اسیدی بودن؛ اسیدی شدن؛ اسیدی کردن**

**اسیر** [1] / 'asîr، ـها؛ ـان؛ أسَرا/: [عربی]/اسم. دیل؛ یەخسیر؛ ئێخسیر؛ ئەسیر؛ ئیسیر؛ یەسیر؛ دۆساخ؛ زینندانی؛ هێشیر؛ هێسیر؛ گرتوو؛ گرتی؛ گراو؛ هەسیر؛ بەردەستە؛ دەردەست؛ کەسێ کە ئازادی لێ گیراوە ‹چهار اسیر آزاد شدند: چوار دیل ئازادکران›.

▣ **اسیر جنگی:** دیلی شەڕ؛ یەخسیری شەڕ؛ گراو لە شەڕ؛ کەسێ کە لە شەڕدا بکەوێتە دەست دوژمن.

▣ **اسیرگرفتن:** دیل گرتن؛ یەخسیرگرتن؛ یەخسیرکردن.

**اسیر** [2]: صفت. دیل؛ دۆساخ؛ یەخسیر؛ ئەسیر؛ گراو؛ گریای؛ گیرۆدەی بەند و داو یان دۆخێکی ناخۆش ‹اسیر غم: دیلی خەم›.

▣ **اسیر بودن:** یەخسیر بوون؛ دیل بوون؛ گیرۆدە بوون.

**اسیر شدن:** دیل بوون؛ گیریان؛ هێسیر بوون؛ یەقیر بوون.

**اسیر کردن:** دیل‌کردن؛ گرتن؛ یەخسیر کردن؛ هێسیرکردن.

**اسیروابیر** / 'asîr-o-abîr/: [عربی] صفت. [گفتاری] دیل و داماو؛ گیر و بەند؛ قەتیس؛ دەسەپاچە؛ تووشیاری دۆخێکی هەرە ناخۆش ‹دو سال آزگار اسیروابیر بچه های برادرم بودم: دووساڵی ڕەبەق گیروبەندی منداڵەکانی کاکم بووم›.

**اسیری** / 'asîrî/: [عربی]/اسم. دیلی؛ دۆساخی؛ یەخسیری؛ هێسیری؛ هەسیری؛ ئەسیری.

**اشارات** / 'ešārāt/: [عربی] ۱. جمعِ ☜ **اشاره** ۲. جمع ☜ **اشارَت**

**اشارپ** / 'ešārp، ـها/: [فرانسوی]/اسم. چارۆکە؛ چارۆک؛ چەتفە؛ چارەکە؛ قوماشێ

که ژنان به سەر شانیاندا ئەیدەن.

**اشارت** / 'ešārat ، ـها؛ اشارات/: [عربی]/اسم. //ادبی/ ئامـاژە؛ هێمـا؛ هیمـا؛ ئیمـا؛ نیـشانک؛ ئیشارەت؛ ئاشیرەت؛ بە دەست یان بە چاو نیشان‌کردن.

**اشاره** / 'ešāre، ـها؛ اشارات/: [عربی]/اسم. ۱. ئاماژە؛ نیشانک؛ فچەنن؛ بە دەست یان بە چاو نیشان‌کردن ۲. هێما؛ هیما؛ ئیما؛ قسەی کورت یان مانا هەڵگر ‹در نامه‌اش اشاره‌ای داشت به عروسی آزاد: لە نامەکەیدا بە زەماوەندی ئازاد هیمایەکی‌کردبوو› ۳. //ادبی/ قامکی شادە؛ دۆشاومژە ☜ انگشت اشاره، انگشت

◙ **اشاره کردن:** ئاماژەکردن؛ هێماکردن.

هەروەها: **اشاره شدن؛ اشاره داشتن**

**اشاعه** / 'ešā'e/: [عربی]/اسم. ۱. بڵاو کردنەوە؛ تەقە داخستن؛ قوو داخستن؛ واتەوات؛ قاو داخستن ۲. بڵاوەپێدەری؛ کاری بلاوە پێدان؛ کاری پەرە پێدان.

◙ **اشاعه‌ی اکاذیب:** درۆ پرژاندن؛ فشە داخستن.

◙ **اشاعه دادن:** پرژاندن؛ پەخشان کردنەوە؛ برەو پێدان؛ پەرە پێدان؛ بەلاڤکرن.

هەروەها: **اشاعه یافتن**

**اشانتیون** / 'ešāntiyon، ـها/: [فرانسوی]/اسم. نموونچ؛ بریتیە لە بەشێکی کەم لە کووتاڵێک کە بە بۆنەی فرۆشیەوە، بە خۆرایی بەش دەکرێتەوە تا باشتر بناسرێ.

**اشباح** / 'ašbāh/: [عربی] جمعِ ☜ **شَبَح**

**اشباع** / 'ešbā'/: [عربی]/اسم. تێری؛ پڕی؛ سێری؛ تێروپڕی.

◙ **اشباع شدن:** تێر بوون؛ پڕبوون: **به حد اشباع رسیدن**

**اشباع کردن:** تێر کردن؛ پڕ کردن؛ تەژیکرن.

**به حد اشباع رسیدن** ☜ **اشباع شدن**

**اشبل** / 'ošbol، ـها/: اسم. گەرا؛ گەراماسی؛ خەرزێ ماسی.

**اشبو** / 'ašbo/: اسم. سوخاڵدان؛ ڕەژیدان؛ خەڵووزدان؛ جێ‌خەڵووز.

**اشپون** / 'ešpon ، ـها/: [روسی]/اسم. [چاپ] یەکەی داندراو بۆ درێژی دێری چاپی، بەرامبەر بە ٤٨ پوینت یان ۱۸٫۰۵ میلی‌متر.

**اشتالنگ** / 'eštālang/ ☜ استخوان قاب، **استخوان**

**اشتباه**[1] / 'eštebāh، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. هەڵە؛ پەڵە؛ سەهو؛ لەسەر چوو؛ دەسەر چوو؛ نەزانست؛ خەڵەت؛ یانش؛ خووڵ؛ بەرهەمی تێ‌نەگەیشتن و هەڵسەنگاندنی چەوت ‹اشتباه مرا تصحیح کرد: هەڵەی لێم هەڵگرتەوە›.

◙ **اشتباه لُپی:** هەڵەی تەواو؛ پەڵەی زەق.

**اشتباه لفظی:** جۆریان؛ زمان بە هەڵەدا چوون؛ شاشیادەڤکی.

◙ **اشتباه درآمدن:** بە هەڵە دەرهاتن؛ ئاکامی بە هەڵە دان.

**اشتباه درآوردن:** بە هەڵە دەرهێنان؛ بە ئاکامی هەڵەگەیشتن.

**اشتباه کردن:** هەڵە کردن؛ پەڕ بوون؛ بە سەهو چوون؛ بە خەڵەت چوون؛ سەهو کردن. هەروەها: **اشتباه بودن؛ اشتباه شدن**

**اشتباه کسی را گرفتن:** هەڵە بۆ کەسێ گرتن؛ هەڵەی کەسێ دەسنیشان کردن؛ هەڵە بۆ کەسێ ڕاستکردنەوە.

**کسی را از اشتباه درآوردن:** کەسێ لە هەڵە ڕزگارکردن؛ ناساندنی هەڵەی کەسێ بە خۆی.

**کسی را اشتباه گرفتن:** کەسێ لە جێی

کەسێکی‌تر زانین.

**کسی را به اشتباه انداختن:** خستنە هەڵەوە؛ کەسێ تووشی هەڵە کردن.

**اشتباه**[۲]: *صفت.* هەڵە؛ سەهو؛ بە دۆخ یان شێوازی نادروستەوە ‹راه اشتباه: ڕێگەی هەڵە›.

**اشتباه**[۳]: *قید. [گفتاری]* هەڵە؛ سەهو؛ ئیشتبا ‹اشتباه کردم: بە هەڵە چووم›.

**اشتباهاً** / 'eštebāhan/: [عربی] *قید.* بە هەڵەوە؛ بە سەهووەوە ‹اشتباهاً زنگ خانەی دیگری را زدم: بە هەڵەوە زەنگی ماڵێکی‌ترم لێدا›.

**اشتباهکاری** / 'eštebāhkārî، ـها/: [عربی/فارسی] *اسم.* هەڵەکاری؛ سەهوکاری؛ شاشیکاری.

**اشتباهی** / 'eštebāhî/: [عربی] *قید. [گفتاری]* بە هەڵە؛ سەهوی؛ لە ڕووی هەڵە یا ئیشتباوە ‹او را اشتباهی گرفتە بودند: بە هەڵە گرتبوویان›.

**اشتداد** / 'eštedād/: [عربی] *اسم. [ادبی]* تەشەنە؛ سەختی؛ تیژی؛ توندی؛ شێرەتی؛ گۆمڕەیی.

▣ **اشتداد یافتن:** تەشەنەکردن؛ سەختەوە بوون؛ توندەوە بوون؛ زۆرگرتن ‹بیماری اشتداد یافت: نەخۆشینەکە تەشەنەی کرد›.

**اشتر** / 'oštor، ـها؛ ـان/: *اسم. [ادبی]* وشتر؛ هێشتر؛ عشتر؛ دەڤە؛ دینە: **شُتُر**

**اشتراک** / 'ešterāk، ـها/: [عربی] *اسم.* هاوبەشی؛ بەشداری: ۱. /ـات/ دۆخ یان چۆنیەتی هاوبەش بوون ‹با اشتراک چند نفر شرکتی تأسیس کردند: بە هاوبەشی چەند کەس شەریکەیەکیان دامەزراند› ۲. کەڵک وەرگرتن لە ڕاژەی بنکەیەک بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ‹اشتراک گاز؛ اشتراک روزنامە: بەشداری گاز؛ بەشداری ڕۆژنامە›.

▣ **اشتراک لفظی:** *[دستور]* هاوتەیی؛ پشکداری دوو وشە کە لە وتنەوەدا وەکوو یەکن و لە واتادا جیاوازن (وەک ڕاویار و ڕاویار، یەکەم بە مانای «ڕێبوار» و دووەم بە واتای «نەچیروان»).

**اشتراک مساعی:** هاوکاری؛ ئاریکاری؛ هاریکاری.

**حق اشتراک** ☜ **حق**

**اشتراکی** / 'ešterākî/: [عربی] *صفت.* ۱. هاوبەشی ‹زندگی اشتراکی: ژیانی هاوبەشی› ۲. *[قدیمی]* کومۆنیستی.

**اشترک** / 'oštorak، ـها/: *اسم.* شاپێل؛ گەڤل؛ لەپاو؛ شەپۆلی گەورە.

**اشتعال** / 'ešte'āl/: [عربی] *اسم.* دۆخ یان چۆنیەتی هەڵبوون؛ پێ‌بوون؛ داگیرسانی ئاگر؛ هەڵگران؛ هەڵگیرسان؛ هۆرگرەی؛ گرەی؛ هەڵگرسیان؛ گیسیاینە.

**اشتعال‌پذیر** / 'ešte'ālpazîr، ـها/: [عربی/فارسی] *صفت.* ئاورگر؛ گرەڕفان ‹پلاستیک از مواد اشتعال‌پذیر است: پلاستیک ماکێکی ئاورگرە›.

**اشتغال** / 'ešteqāl، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* فی: ۱. مژولی؛ کار و ڕەوتی پەرژین؛ پەرژان؛ پەرژیان؛ خەریک بوون؛ خجڵیان؛ مەشخووڵ بوون؛ خەریک بوون ‹اشتغال بە تحصیل: پەرژین بە خوێندنەوە› ۲. ئیش؛ کار؛ هەرمانە؛ شوول؛ شوغڵ ‹ایجاد اشتغال: ئیش‌سازی›.

▣ **اشتغال داشتن:** لە کار بوون؛ ئەرکێ کردن؛ خجڵیان بە کارێکەوە؛ سەرقاڵ بوون؛ خەریک بیەی؛ ب شوول بوون.

**اشتغال ورزیدن:** دەست بە کارێکەوەدان؛ کاریو گێرتەی وێرە؛ دەست ب شوولەکێ کرن.

**اشتغال‌زا** / 'ešteqālzā/: [عربی/ فارسی]

*صفت.* کارهێنەر؛ کارخۆشکەر؛ خاوەنی ئیمکانی وەدی هێنانی پیشە ‹قالیبافی از فعالیتهای اشتغال‌زا است: قالی‌چنی لە چالاکیگەلی کارهێنەرە›.

**اشتقاق** / ešteqāq/': [عربی]/*اسم.* دۆخ یان چۆنیەتی لێک بوونەوە؛ جیابوونەوە؛ لێک‌بڕان؛ لە یەک بڕیان: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی کەلاشتە و جیا بوونەوە لە یەکتر ‹اشتقاق قارەها: لێک‌بوونەوەی قوڕنەکان› ۲. *ـها؛ ـات//دستور/* دروست بوونی وشەیەک لە وشەیەکی‌تر (وەک «خەو»، «خەوتوو» و «خەوالوو» کە لە لقەکانی خەوتنن).

⊡ **اشتقاق یافتن:** جیابوونەوە؛ لێک بوونەوە؛ لە یەک چووچیان؛ ژێک ڤەبوون.

**اشتلم** / oštolom/'، ـها/:/*اسم.* ۱. هاش و هووش؛ لاف و گەزاف؛ بافیش؛ بە خۆدا هەلگوتن و پەسنی خۆ دان ۲. گوڕ و هەرا؛ زۆربێژی و هەرا و هوریا کردن و داخوڕین.

هەروەها: **أشتُلُم کردن**

**اشتها** / ešteha/': [عربی]/*اسم.* واژۆ؛ بڕۆک؛ ئیشتیا؛ گێڤل؛ مەگێز؛ مجێز؛ جوفا؛ ڕەوتی دڵ‌بردن؛ وەشتی؛ واشتن؛ وازی خواردن ‹نمی‌دانم چرا امروز هیچ اشتها ندارم: نازانم بۆچی ئەمڕۆ هیچ دلم ناوێ›.

⊡ **اشتها داشتن:** گز و فت بوون؛ دڵ بردن؛ حەزۆ خارنێ‌کرن؛ حەز بە خواردەمەنی کردن.

**اشتها کور شدن:** گێڤل کوێرەو بوون؛ بێ‌ئیشتیا بوون.

**از اشتها افتادن:** لە مەگیزکەوتن؛ ئیشتیا لە دەست دان.

**به اشتهای دیگران نان خوردن:** */مجازی/* بە سازی دیتران سەما کردن؛ بە هێوای خەلکی لووت‌بەرز بوون؛ بە هومێد یا ئامرازگەلی کەسێکەوە کارێ‌کردن.

**اشتهاآور** / ešteha.āvar/': [عربی/ فارسی] *صفت.* تەبیات‌خواز؛ واشتنی؛ بزوێنەری وازی مرۆ بۆ خواردن.

**اشتهار** / eštehār/': [عربی]/*اسم.* ۱. بەناوبانگی؛ چۆنیەتی بە ناوبانگ بوون ۲. ناوبانگ؛ شۆرەت.

⊡ **اشتهار داشتن:** بە ناوبانگ بوون؛ ناودار بوون؛ نامێ تەقایوە.

**اشتهار یافتن:** ناوبانگ دەرکردن؛ ناو داخستن؛ ناو پەیداکردن؛ نامێ لوەی.

**اشتیاق** / eštiyāq/': [عربی]/*اسم.* تاسە؛ تامەزرۆیی؛ تارسە؛ حەز؛ واز؛ ئیشتیا؛ ئارەزوو؛ عەزرەت؛ بیهر؛ سوو؛ هەوا؛ نگەشن؛ شنیان؛ شنین؛ عەز؛ هۆک؛ سوێ؛ تاسی ‹او اشتیاق زیادی به دیدن شما داشت: تاسەیەکی زۆری بۆ دیتنی ئێوە بوو›.

**اشجار** / ašcār/': [عربی]/*اسم. //ادبی/* دار و دەوەن؛ داران؛ دار و درەخت؛ دارێ ‹اشجار جنگلی: دارودەوەنی دارستانی›.

⊡ **اشجار مُثمِر:** بەرداران؛ وەچە داران؛ داری بەردار؛ داری میوە.

**اشخاص** / ašxās/': [عربی] جمعِ ☜ **شَخص**

**اشد** / ašad(d)/': [عربی] *صفت.* توندترین؛ سەخت‌ترین.

⊡ **اشدّ مجازات:** توندترین سزا.

**اشرار** / ašrār/': [عربی]/*اسم.* ۱. جمعِ ☜ **شَریر** ۲. ئاژاوەچیان؛ کەسانێ کە ئاژاوە و بشێوە دەنێنەوە.

⊡ **اشرار مسلّح:** چەتەی چەکدار؛ چەکدارێن شەڕانی.

**اشراف** / ašrāf/': [عربی]/*اسم.* خانەوادان؛ گەورەمالان؛ مازنان؛ کەسانی خاوەن پلەی ڕامیاری، کۆمەلایەتی و ئابووری لە سۆنگەی باب و باپیرانیانەوە.

**اشراف** / ešrāf/': [عربی]/*اسم.* ۱. چاوەدێری؛

لـه سـەرەوە بـۆ خـوارەوە بیـنین ۲. *[مجـازی]* ئاگاداری ‹اشراف بر ضمایر بندگان خدای داشت: ئاگـاداری لـە دڵ و دەروونی بـەنـدەگـەلی خـوا هەبوو›.

⊡ **اشـراف داشـتن:** ئاگـادار بـوون؛ دیـتن؛ گورەتەنەی؛ لە بەر چاوەوە بوون.

**اشرافـسالاری** / aš̌rāfsālārî'/: [عربـی/ فارسـی] /سم. خانخانی؛ دەرەبەگایەتی.

**اشـرافمـنش** / aš̌rāfmaneš', ـهـا؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ئاغـەوات؛ خـاوەن خـدە و ئاکاری ئاغەواتی.

**اشـرافمنـشانه** / aš̌rāfmanešāne'/: [عربـی/ فارسی] *صفت.* ئاغەواتانە.

**اشرافی** / aš̌rāfî'/: [عربی] *صفت.* ئاغەواتی.

**اشـرافیت** / aš̌rāfîyyat', ـهـا/: [عربـی]/*سم.* ئاغەواتی.

**اشـراق** / eš̌rāq'/: [عربـی]/*سم.* ئیـشراق: ۱. توانـایی دۆزینـەوەی ڕاسـتی، بـێبـەڵـگەی روون و تـەنیـا بـە هەسـت و بڕشـتی زەیـن ۲. فـەلـسەفـەیـەک کـە بـڕوای بـە دۆزینـەوە و تێگەیـشتنی ڕاسـتی بـە یارمـەتی هـزر و بـیر و چێژی دەروونیە.

**اشـراقی** / eš̌rāqî' ، ـان؛ ـون/: [عربـی] *صفت.* ۱. سەر بـە ئیـشراق ۲. هـۆگر و پـشتبـەسـتوو بە ئیشراقەوە.

**اشـربه** / aš̌rabe'/: [عربی]/*سم. [نامتـداول]* جمـع ☜ **شـراب** ۲. *[ادبـی]* خواردنـەوەییگـەل؛ خواردنەوەییەکان.

**اشـرف** / aš̌raf'/: [عربـی] *صـفت.* بـەرزتـر؛ بەڕێزتر؛ هەڤیاز.

⊡ **اشـرف مخلوقـات:** بـەڕێزتـرین ئـافرێنراوی خوا؛ بریتی لە مرۆڤ؛ بەشەر.

**اشرفی** / aš̌rafî', ـها/: [عربی]/*سم.* ئـەشرەفی؛ سـوورەتشـایی؛ سـکە زێـڕێکی بچووکـە بـۆ خشڵ دەکار دێ.

**اشعار** / aš̌'ār'/: [عربی] جمعِ ☜ **شعر**

**اشـعار** / eš̌'ār'/: [عربـی]/*سم.* ئاگـاداری؛ هـای؛ جەی؛ هەواڵ.

⊡ **اشعار داشتن/ کـردن:** دەنـگکـردن؛ ئاگـادار کردن.

**اشـعری** / aš̌'arî'/: [عربـی] *صـفت.* ئـەشـعەری: ۱. پێـوەندیـدار یـان سـەر بـە ڕێبـازی ئەشـعەریـەوە ۲. /ـها؛ ـان/ شـۆپگر و هـۆگری ڕێبازی ئەشعەری.

**اشـعریه** / aš̌'arîyye'/: [عربـی]/*سم.* ئـەشـعەرییـە؛ ڕێبـازێکی کـەلامـی کـە ئەبووحەسەنی ئەشعەری دایمەزراند.

**اشـعه** / aš̌e'e, 'aš̌a'e'/: [عربـی]/*سم.* ۱. جمـعِ ☜ **شُـعاع** ۲. تیـشک؛ تیـسک؛ تیجیـە؛ پەرتەو؛ تابشت؛ تیشکدەری.

**اشـغال** / eš̌qāl'/: [عربـی]/*سم.* ۱. دابـڕیّ؛ داگـیری؛ زۆربگـیری؛ کـار یـان ڕەوتی داگـرتنی شـوێنێک ‹اشغال شهر بـه وسیله‌ی نیروهـای دشـمن: داگرتنـی شـار بـە هـۆی هێـزەکـانی دوژمنـەوە› ۲. ئـەشـغاڵ؛ کـار یـان ڕەوتی بـە کـار گـیران ‹اشغال تلفـن کـار درستی نیست: ئەشغاڵـی تەلـەیفـوون کـارێکی بـاش نیـە›.

هەروەها: **اشـغال بـودن؛ اشـغال شـدن؛ اشـغال کردن**

**اشـغالگر** / eš̌qālgar', ـها؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی] *صفت.* داگیرکەر؛ دابڕکەر.

**اشـغالی** / eš̌qālî'/: [عربـی] *صـفت.* ۱. دابـڕی؛ زۆربگـیری ۲. داگیرکـەر ‹نیروهـای اشـغالی: هێـزە داگیرکـەرەکـان› ۳. داگیرکـراو؛ داگـیراو ‹سرزمینهای اشغالی: خاکە داگیرکراوەکان›.

**اشق** / aš̌aq'/ ☜ **أشَک**

**اشـقیا** / aš̌qiyā'/: [عربـی]/*سم.* ۱. جمـعِ ☜ **شَـقی** ۲. *[اسلام]* دژمنـانی پێغـەمبـەری ئیسلام و بنەماڵە و یارانی.

**اشک** / aš̌k, 'aš̌g'/: /*سم.* فرمێسک؛ ئـەسرین؛

هەرەس؛ هەسر؛ ئرمس؛ ئرمێس؛ گورمیس؛ ئەسر؛ هەرسی؛ هێستر؛ هێسیر؛ هەستار؛ ڕۆنتک؛ ڕۆندک؛ ئەنو؛ هەرش؛ هێرش؛ فرێش؛ ڕۆنکی؛ ئە شک؛ ڕوندک؛ لۆرک؛ ئاوی چاو * **اشگ**

▣ **اشک بلبل:** ۱. *[مجازی]* شەونم؛ ئاونگ؛ خوناڤ ۲. *[مجازی]* ئارەق؛ ئەرەق؛ ودکا؛ مەی.

**اشک پیازی:** *[کنایی]* گریانی بە درۆ و ڕواڵەتی.

**اشک تمساح:** *[کنایی]* فرمێسکی درۆیین؛ فرمێسکی درۆیینە.

**اشک حسرت:** فرمێسکی پەژیوانی.

**اشک شادی:** کەنی گری؛ فرمێسک بزە؛ فرمێسکی شادی لە چاو هاتن: **اشک شوق**

**اشک شمع:** فرمێسکی شەم؛ تنۆکەی مۆم؛ تکەی مۆم؛ دڵۆپە تواوەکانی شەم کە لە کاتی سووتاندا دەتکێت.

**اشک شوق** ☜ **اشک شادی**

▣ **اشک توی مشک داشتن:** *[مجازی]* سەراوی کەسێ نزیک بوون؛ ئامادەی گریان بوون؛ گریان لە گیرفان بوون؛ دڵ ناسک بوون.

**اشک ریختن:** فرمێسک ڕژاندن؛ ڕوندک ڕێتن.

**اشک کسی را درآوردن:** گریاندنی کەسێک؛ هەرسوو یۆی ئاردەینە چەمی: **اشک گرفتن**

**اشک گرفتن** ☜ **اشک کسی را درآوردن**

**اشک** / 'ošak/: ـها/: *اسم.* بەهەک؛ جەوگە بەهەک؛ بنەگیایەکی چەتریە، شیرەکەی دەرمانە: **کُندَل؛ اشق**

**اشکاف** / 'eškāf/: ـها/: *اسم.* گەنجە؛ خەلوەتی؛ ژووری کەلوپەل.

**اشکال** / 'aškāl/: [عربی] جمعِ ☜ **شِکل**

**اشکال** / 'eškāl,'ešgāl/: ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* گرفت: ۱. دژواری؛ سەختی؛ ئاریشەیی ‹در اثر برف، حرکت خودروهای سواری با اشکال روبرو شد: بە هۆی بەفرەوە، هاتوچووی ماشینگەلی سواری تووشی گرفت بوو› ۲. کەموکووڕی؛ لەنگی؛ نارێکی؛ خەوش؛ نوقسان ‹پرونده‌اش اشکال داشت: پەروەندەکەی گرفتی هەبوو›.

▣ **اشکال پرسیدن:** گرفت پرسینەوە؛ لە دژواری پرسین.

**اشکال تراشیدن:** ڕێخ تێخستن؛ بیانوو گرتن؛ تەگەرە تێخستن؛ گێچەڵ تاونایوە.

**اشکال درآوردن:** گێچەڵ کردن؛ عەیب گرتن؛ سەختی پێش‌هێنان؛ گێچەڵ وسەینە.

**اشکال نداشتن:** قەی‌نەکردن؛ بێ‌گرفت بوون ‹اشکال ندارد خودم انجام می‌دهم: قەی‌ناکا خۆم جێبەجێی دەکەم›.

**اشک‌آلود** / 'aškālûd, 'ašg-/: *صفت.* فرمێسکاوی؛ هەرسین ‹چهره‌ی اشک‌آلود: ڕوخساری فرمیسکاوی›.

**اشکبار** / 'aškbār,'ašg-/: *صفت.* فرمێسکاوی؛ فرمێسکبار؛ فرمێسکڕێژ؛ پڕفرمێسک ‹چشم اشک‌آلود: چاوی فرمیسکاوی›.

**اشکریز** / 'aškrîz, 'ašg-/: *صفت.* فرمێسکبار.

**اشکریزان** / 'aškrîzān, 'ašg/: *قید.* گریان-گریان؛ بە گریان-گریان؛ بەگریانەوە ‹اشکریزان پیش مادرش دوید: بە گریانەوە چوو بۆ لای دایکی›.

**اشکفت** / 'eškaft/: *اسم.* ۱. شەق؛ قەڵش؛ دڕنە؛ ترەکە؛ درز؛ دەرزی جۆگەلەی ئاو ۲. [عربی] ئەشکەوت؛ شکەفت؛ ئەشکەفت؛ مەڕە.

**اشکل** / 'eškel, 'ešgel/: *اسم.* ۱. *[قدیمی]* لزگە؛ پەتێک کە کاتی ناڵ کردنی چوارپا،

دەست و پای پێ دەبەستن ٢. [گفتاری] دژواری؛ سەختی؛ گێچەڵە.

**اشكلك** / 'eškalak/: اسم. [قدیمی] چێوێک کە بۆ ئەشکەنجە یان تەمێ کردن دەخرایە لای قامکەوە و دەیانگووشی: **اشكنك**

**اشكمبه** / 'eškambe/: اسم. ورگ؛ ئەشقەمە؛ عرک؛ عویر؛ حویر؛ سەخور؛ جێگە ڕۆخڵە لە زگدا.

**اشكنك** / 'eškanak/ ☜ **اِشکَلَک**

**اشكنه** / 'eškene/: اسم. ئەشکەنە؛ کارواناشی؛ پیازاو؛ چێشتاوێکە بە ڕۆن و پیواز و ئاردەوە، جار و باریش سەوزی و هێلکەی تێدەکەن.

**اشكوب** / 'oškûb/ ـها/: اسم. ١. قات؛ نهۆم؛ تەبەق؛ قاتی خانوو ٢. قاتێکی خانوو ٣. [زمین‌شناسی] لە دابەشکراوگەلی چکۆلەی خولی زەوین‌ناسی ✻ **طبقه**

**اشكوبه** / 'oškûbe/: صفت. ماخ؛ نهۆم؛ نوهۆم؛ قۆر؛ نشف؛ تەبەقە؛ قات لە خانوو؛ قات؛ بە نهۆم ‹خانەی چهار اشکوبه: ماڵی چوار نهوم›.

**اشگ** / 'ešg/ ☜ **آشک**

**اشل** / 'ešel/ ـها/: [فرانسوی] اسم. ١. پێوانە؛ کەوچ؛ پێومان؛ پیڤەر ٢. پلەوپایە؛ پێگە.

▣ **اشل بومه** ☜ مقیاس بومە، **مقیاس**

**اشل حقوق**: پێومانی مووچە؛ پیڤەری قانوونی.

**اشل طرح**: پێومانی گەلاڵە؛ پێڤەری پلانی.

**اشمئزاز** / 'ešme'zāz/: [عربی] اسم. [ادبی] بێزاری؛ بێز؛ گرخ؛ قیز؛ قەڵسی؛ وەڕەزی؛ هەستی بێزکردنەوە و زۆر تووڕە بوون ‹از بوی سیر اشمئزاز دارد: لە بۆی سیر بێزی دێتەوە›.

**اشنار** / 'ošnār/: اسم. ئاوە ڕۆ؛ گونج؛ کونێ لە دیواردا بۆ دەرباز بوونی ئاو.

**اشنان** / 'ošnān/ ـها/: اسم. شۆرەک؛ زرویێ؛ کەفکەفۆک؛ گیاکەفە؛ بنەگیایەکە کەف دەکا و جاران جلیان پێ دەشۆرد.

**اشو** / 'ašû/: صفت. [ادبی] پیرۆز؛ مبارەک؛ ممبارەک.

**اشهد** / 'ašhad/: [عربی] دعا. [مخفف] اشهد ان لا الـه الا اللّـه (شاهێدی ئەدەم جگە لە ئەڵلا خودایەکی دیکە نیە).

▣ **اشهد خود را گفتن/ خواندن**: [کنایی] شایەتیمان هێنان/ هاوردن؛ شاتیمان هاوردن؛ ئامادەی مەرگ بوون؛ بەرهەڤی مەرگ بوون.

**اشهر** / 'ašhar/: [عربی] صفت. بەناوبانگتر؛ ناودارتر؛ نامدارتەر؛ مەشهوورتر.

**اشیا** / 'ašyā/: [عربی] جمعِ ☜ **شيء**

**اصابت** / 'esābat/: [عربی] اسم. [ادبی] ١. کار یان ڕەوتی ماڵین؛ دان؛ لێکدان؛ پێکدادان؛ لێکەوتن؛ لێکدانی شتێ لە شتێ ‹سرم به دیوار اصابت کرد: سەرم دای لە دیوارەکە› ٢. [نامتداول] پێکان؛ بار یا چۆنیەتی دروست بوون؛ بریتی لە زانین ‹اصابت رای؛ خوب اصابت کردەای: پێکانی ڕا؛ باشت پێکاوە›.

▣ **اصابت کردن**: لێدان؛ بەرکەوتن؛ وێکروتن؛ لێکەوتن؛ کەوتن ‹تیر به پایش اصابت کرد: تیر دای لە پای›.

**اصالت** / 'esālat, 'asālat/: [عربی] اسم. ڕەسەنی؛ ڕەسەنایەتی ‹اصالت خانوادگی: ڕەسەنی بنەماڵەیی›.

▣ **اصالت اسم** ☜ **نامگرایی**

**اصالت تصوّر** ☜ **ایده‌آلیسم ـ١**

**اصالت تعقّل** ☜ **خِرَدگرایی**

**اصالت خانوادگی**: ڕەسەنی بنەماڵە؛ ڕەسەنایەتی خێزانی.

**اصالت ذهن** ☜ **ذهن‌گرایی**

**اصالت رفتار** ☜ **رفتارگرایی**
**اصالت عقل** ☜ **خِرَدگرایی**
**اصالت عمل** ☜ **عمل‌گرایی**
**اصالت فایده** ☜ **سودگرایی**
**اصالت فرد** ☜ **فردگرایی**
**اصالت فکر** ☜ **ایده‌آلیسم ـ۱**
**اصالت کثرت** ☜ **کثرت‌گرایی**
**اصالت لذت** ☜ **لذّت‌گرایی**
**اصالت مادّه** ☜ **ماتریالیسم**
**اصالت محیط** ☜ **محیط‌گرایی**
**اصالت معنی** ☜ **ایده‌آلیسم ـ۱**
**اصالت نفع** ☜ **سودگرایی**
**اصالت واقع** ☜ **واقع‌گرایی**
**اصالت وجود** ☜ **اگزیستانسیالیسم**
**اصالت وسیله** ☜ **ابزارگرایی**

▣ **اصالت داشتن**: ۱. ڕاسا بوون؛ ڕاوەستاو بوون؛ پاوەجێ بوون ۲. ڕەسەن بوون؛ ڕەسەنایەتی هەبوون؛ لە بنج و بناوان نەترازان.

**اصالتاً** / 'esālatan, 'asālatan/: [عربی] *قید*. *[حقوق]* لە لای خۆوە؛ لە لایەن خۆوە. بەرانبەر: **وکالتاً**

**اصحاب** / 'ashāb/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* ۱. جمعِ ☜ **صاحب** ۲. جمعِ ☜ **صَحابی** ۳. یاران؛ دۆستان ٤. خاوەنان؛ خاوەنگەل.

▣ **اصحاب وحی**: پەیغەمبەران؛ ناردراوانی خودا.

**اصرار** / 'esrār، ـها/: [عربی] *اسم*. پێداگری؛ پێکۆڵی؛ چوڕ؛ خڕ؛ کوت؛ میچ؛ پڕل؛ پاملی؛ پێ‌گەزی؛ پێ‌چەقانی؛ لووبلووب؛ کار یان ڕەوتی لە سەر ڕۆیشتن؛ لە سەر ڕۆین؛ سووری لە سەر شتێ؛ ویستی بەردەوامی شتێ ‹چرا این قدر اصرار می‌کنی: بۆچی ئەمەندە پی دادەگری؟›.

**اصطبل** / 'establ/: [معرب از لاتینی] ☜ **اِستَبل**

**اصطکاک** / 'estekāk، ـها/: [عربی] *اسم*. ۱. دۆخ یان چۆنیەتی لێکخشان؛ خشان؛ مالیان؛ سووان؛ لێکساوین ‹بر اثر اصطکاک پاره شده است: بە هۆی لێکخشانەوە دڕاوە› ۲. لێکدان؛ پێکدان؛ مالیان؛ لێکەوت ‹اصطکاک دو شی با هم: لێکدانی دوو شت› ۳. *[فیزیک]* خۆگری ڕووی لەیەکدانی دوو شت لە بەرانبەر جوولانەوەیاندا.

**اصطلاح** / 'estelāh، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم*. دەستەواژە؛ زاراوە؛ وشە یان ڕستەیەک کە لە ناو دەستەیەکی دیاریکراو لە زانست، هونەر، کار یان پیشەدا، خاوەن واتایەکی تایبەتی و جیاکارە ‹اصطلاح ادبی: دەستەواژەی وێژەیی›.

**اصطلاحنامه** / 'estelāhnāme، ـها/: [عربی/فارسی] *اسم*. زاراوەنامە؛ فەرهەنگی زاراوە؛ تیرمینۆلۆژی؛ فەرهەنگی تایبەتی بە ڕاڤەی وشەگەلی باو لە یەک بوار یان بابەتی دیاریکراودا: **ترمینولژی**

**اصطلاحی** / 'estelāhî/: [عربی] *صفت*. زاراوەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە زاراوە.

**اصغا** / 'esqā/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* گوێڕاگری؛ گوێڕادێری؛ گوێ‌گیرتەی؛ کار یان ڕەوتی گوێدان بە وتاری کەسێک.

**اصغر** / 'asqar/: [عربی] *صفت*. چکۆلەتر؛ وردتر؛ هووردتر؛ بچووکتر؛ گچکەتر؛ بچکۆلەتر؛ ڕێزتەر؛ وردیتەر؛ ویقلەتەر؛ گولالەتەر.

**اصفهان** / 'esfahān/: [معرب از فارسی] *اسم*. ئیسفەهان؛ مەقامێکی دەزگای هومایوون؛ یەکێ لە پێنج مایەی مووسیقای ئێران: **بیات اصفهان**

**اصل**[1] / 'asl، ـ ها؛ اصول/: [عربی] *اسم*. سۆلان؛ ما؛ بنیچە؛ سفن؛ ماک؛ بنەما؛ لانەما؛ مەخز؛ قولتیە؛ دڕف؛ خاسە؛ هەرخۆ: ۱. بنەڕەت؛

پێز؛ خیم؛ ڕەگەز؛ بنیچە؛ بنچینە ‹این کار از اصل غلط است: ئەم کارە لە بنەڕەتدا هەڵەیە› ٢. بنیچە؛ ڕەسەن؛ ناوپشتە؛ ڕەچەڵەک؛ ڕەگەز؛ نەژاد؛ ڕەگ؛ بنەچەک؛ بنەچەقە؛ بنەچەک ‹اصل او از کرمانشاه است: لە بنچینەوە کرماشانیە› ٣. پێز؛ ئەسڵ؛ بنەما؛ بنەوان؛ قانوون و بنەما ‹اصل ارشمیدس: پێزی ئەرەشمیدوس› ٤. خود؛ خودی خۆ ‹اصل سند: خودی بەڵگە›.

▣ **اصل اباحه:** *[فقه]* بنەمای ڕەوایی؛ هەرچی قەدەغە نەکرابێ، ڕەوایە.

**اصل استقرا** ☜ **استقرا**

**اصل برائت:** *[حقوق]* بنەمای بێتاوانی؛ هەرکەس تا کاتێ تاوانێکی لە سەر نەسەلمێندرا بێ، بێتاوان دێتە ئەژمار.

**اصل برگشتپذیری:** *[فیزیک]* قانوونی گەڕانەوەی ڕاستەوخۆ (بۆ نوور داندراوە).

**اصل بقای ماده و انرژی:** *[فیزیک]* قانوونی مانەوەی ماک و وزە؛ ماک و وزە دوو بنەمای ڕاستەقینەی هەرماون کە هەر بووگن و هەر دەمێنن و قەت نافەوتن، بەڵکوو پێکەوە جێگۆڕکێ دەکەن و دەبنە یەکتری.

**اصل تفکیک قوا:** بنەمای جیاکردنەوەی هێز و دەسەڵات؛ جیابوونی هەرێمی بەرپرسیارێتی هێزەکانی قانووندانەری (پەرلەمان)، بەڕێوەبەری (سەرکۆماری) و دادوەری (داد).

**اصل دولتهای کاملهالوداد:** *[حقوق]* قانوونی ولاتانی بە تەبا و ڕەبا؛ بنەمایێک لە حقۆقی نێونەتەوەییدا کە دەڵێ هەموو ئەو ولاتانە کە ئەم قانوونەیان ئیمزا کردووە، دەبێ هەموو ماف و چارەیەک وا بۆ ولاتێکیتر دەیناسن و باوەڕیان پێ هەیە، بۆ گشت ولاتانی ئەم پەیمانە بیناسن و باوەڕیان پێ بێ.

**اصل صحت:** *[حقوق]* بنەمای دروستی؛ هەموو بڕیارنامەیەک تا پێچەوانەکەی نەسەلمێندراوە، دروست و جێبڕوایە.

**اصل ضرورت علّی** ☜ **جبرگرایی**

**اصل کاری:** گرینگ؛ گرنگ ‹اصل کاری به اداره امور است: گرینگ بەڕێوە بردنی کارەکانە›.

**اصل موجبیّت** ☜ **جبرگرایی**

**اصل موضوعه/ موضوعی:** *[منطق]* ئەو بڕیارە کە لە زانستی بەڵگەییدا، خۆبەخۆیی سەلماوە و بەبێ بەڵگە هێنانەوە وەردەگیردرێ و بۆ سەلماندنی حوکمی دیکە بەکار دێت.

**اصل همه یا هیچ** ☜ قانون همه یا هیچ، **قانون**

**از اصل:** لە بنەڕەتەوە؛ لە بنەڕەتێڕا؛ لە بنەوە؛ لە بنەمادا؛ لە بنچینەوە ‹من از اصل با این کار مخالف بودم: من لە بنەڕەتەوە دژی ئەم کارە بووم›.

**در اصل:** لە ڕاستیدا؛ دەبناغەدا.

**اصل**[٢]: *صفت. [گفتاری]* ڕەسەن؛ ماک؛ ئەسڵ؛ عەسڵ؛ هەرخۆ ‹جواهر اصل: گەوهەری ڕەسەن›. هەروەها: **اصل بودن**

**اصلاً** /'aslan/: [عربی] *قید.* ١. لە بنەڕەتدا ‹اصلاً شیرازی بود: لە بنەڕەتدا شیرازی بوو› ٢. هەر؛ هەرگیز؛ قەت؛ بە هیچ جۆر ‹اصلا نیامد: هەر نەهات› ٣. دەیجا؛ ئەگەریچ؛ ئەوسایچ؛ تازە؛ خۆ؛ بەڵام ‹خودم درستش میکنم، اصلا درست هم نشد که نشد: هەرخۆم چاکی دەکەمەوە، دەیجا چاکیش نەبووەوە، نەبووەوە› ٤. هیچ ‹اصلا پولی در بساطم نماند: هیچ پارەیەکم پێنەما› ٥. یانخود؛ نەخێر ‹اصلا بیا کار دیگری بکنیم: یانخود وەرە کارێکی دیکە بکەین›.

**اصلاح** / eslāh'، ـــها؛ ـات/: [عربی]/*اسم*. ۱. چاکسازی؛ کار و ڕەوتی چاککردنەوە ‹اصلاح رفتار کودکان بزهکار: چاکسازی کردەوەی منالانی خەتاکار› ۲. چاککردن؛ باشکردن؛ کارێک کە بۆ چاکترکردنی چۆناوچۆنی شتێ بکرێ ‹اصلاح خاک: چاککردنی خاک› ۳. ئیسلاح؛ کورت کردنەوە و ڕێککردنی مووی سەر و ڕیش و سمێل.

◘ **اصلاح دینی**: چاکسازی دینی؛ بزووتنەوەیەک کە لە سەدەی ۱٦ی زایینیەوە بۆ چاکسازی ئایینی مەسیح لە ئورووپای ڕۆژاوادا پێکهات.

**اصلاح سر**: سەر دروستکردن؛ چاک کردنی سەر؛ سەرە وەشکەردەی. هەروەها: **اصلاح صورت**

◘ **اصلاح شدن**: دروست بوون؛ چاک بوون.

**اصلاح کردن**: ۱. خاسکردن؛ چاکردن ۲. سەر و ڕیش دروستکردن.

**اصلاحات** / eslāhāt'/: [عربی]/*اسم*. چاکەسازی؛ چاککردنەوە؛ ئەو کارانە وا بۆ چاکترکردنی بارودۆخی کۆمەلایەتی، ئابووری و رامیاری دەکرێ ‹اصلاحات فرهنگی: چاکەسازی فەرهەنگی›.

**اصلاحپذیر** / eslāhpazîr'، ـها؛ ـان/: [عربی/فارسی] *صفت*. چاکەپەژێر؛ چاکەپەزێر؛ خاوەن توان یان ئەگەری باش بوون ‹این پسر اصلاحپذیر نیست: ئەم کوڕە چاکەپەژێر نیە›. هەروەها: **اصلاح بشو؛ اصلاحشدنی؛ اصلاحناپذیز**

**اصلاحطلب** / eslāhtalab'، ـها؛ ـان/: [عربی] /*اسم*. چاکخواز؛ چاکەخواز؛ چاکیخاز؛ خوازیاری چاکەسازی، بەتایبەت لە دۆخی سیاسی، کۆمەلایەتی و فەرهەنگیەوە.

**اصلاحطلبانه** / eslāhtalabāne'/: [عربی/فارسی] *صفت*. چاکەخوازنە؛ چاکسازیانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە چاکەخوازی.

**اصلاحی** / eslāhî'/: [عربی] *صفت*. ۱. روونکراوە ۲. چاککراو ‹مقاله اصلاحی را به چاپخانه فرستاد: وتارە چاککراوەکەی بۆ چاپخانە نارد›.

**اصلاحیه** / eslāhîyye'، ـــها/: [عربی]/*اسم*. روونکراوە؛ چاککراوە؛ ئەوەی بۆ چاکەکردنی قانوون یا نووسراوەیەکیتر دەنووسرێت ‹اصلاحیەی قانون: روونکراوەی قانون›.

**اصلح** / aslah'/: [عربی] *صفت*. چاکتر؛ خاستر؛ باشتر؛ عالەتر؛ خووتر؛ بەیتەر.

**اصلونسب** / asl-o-nasab'، ـــها/: [عربی] /*اسم*. بنوبناوان؛ ڕەگەز؛ بنەچە؛ بنچەکە؛ بنەچەکە؛ بنچینە؛ بنیچە؛ تۆ و تۆرەمە؛ زوقر؛ باب و باپیران ‹از اصلونسب داماد پرسیدیم: لە بنوبناوانی زاوامان پرسی›.

**اصله** / asle'/: [عربی]/*اسم*. بن؛ چل؛ بنە؛ چلێ؛ بنێ؛ گلوێ (بۆ دارگوێز)؛ یەکەی ژماردنی دار و درەخت ‹پنج اصله درخت گردو: پێنج بن دارگوێز›.

**اصلی** / aslî'، ـــها/: [عربی] *صفت*. سەرەکی: ۱. بنەڕەتی؛ بنچینەیی ‹لولەی اصلی: لوولەی سەرەکی› ۲. گرینگ ‹حرف اصلی آزاد تقاضای وام بود: قسەی سەرەکی ئازاد داوای وام بوو› ۳. ڕاستەقینە؛ ئەسلی ‹شغل اصلی: پیشەی سەرەکی›.

**اصلیت** / aslîyyat'/: [عربی]/*اسم*. *[گفتاری]* ۱. ڕەگەز؛ بنچینە؛ بنەچە؛ ڕەچەلاک؛ ڕەتەوە؛ تۆرەمە ‹باید اصلیت آن معلوم شود: ئەبێ بنچینەکەی بزانرێ› ۲. سەرچاوە؛ سەرچاوکە.

**اصلیتاً** / aslîyyatan'/: [عربی] *قید*. *[گفتاری]* لە بنەچەوە؛ لە بنیچەوە ‹او اصلیتاً بانەای است:

له بنیچه‌وه بانه‌ییه›.

**اصم** / 'asam(m)/: [عربی] صفت. [ادبی] ١. که‌ڕ؛ که‌ڕوکاس ٢. لێڵ؛ تاریک؛ نادیار.

◻ **عدد اصم** ☜ عدد گنگ، **عدد**

**اصناف** / 'asnāf/: [عربی]/اسم. ١. جمعِ ☜ **صِنف** ٢. بازاڕیان؛ بازاڕیگه‌ل.

**اصنام** / 'asnām/: [عربی] جمعِ ☜ **صَنَم**

**اصوات** / 'asvāt/: [عربی] جمعِ ☜ **صَوت**

**اصول** / 'usûl, 'osûl/: [عربی]/اسم. ١. جمعِ ☜ **اَصل** ٢. [مجازی] بنه‌ما؛ بنه‌ماگه‌ل؛ قانوونه بنه‌ڕه‌تیه‌کان؛ ڕێ‌وشوێن ‹اصول نواختن تار: ڕێ‌وشوێنی تار ژه‌ندن›.

◻ **اصول اخلاقی:** ڕێ و شوێنی ئاکاری.

**اصول دین:** ڕێ و شوێنی بنه‌ڕه‌تی دین.

◻ **اصول دین پرسیدن:** [کنایی] بۆ نوک و نخۆشه‌ر گه‌ڕان؛ له نووک و به‌د پرسین؛ پرس و ڕای زۆر و ناڕه‌واکردن.

**اصولاً** / 'usûlan, 'osûlan/: [عربی] قید. له‌ڕاستیدا؛ له‌بنه‌ڕه‌ته‌وه؛ جه بنه‌وه ‹این کار اصولاً درست نیست: ئه‌م کاره له ڕاستیدا دروست نیه›.

**اصولگرا**/ 'usûlgerā, 'osûl-/ ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] قید. بناوانگر؛ بنه‌ماگره‌و؛ بنه‌ماخواز؛ ئۆگری بنه‌ماخوازی: **بنیادگرا**

**اصول‌گرایی** / 'usûlgerāyî, 'osûl-/ ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. بناوانگری؛ بنه‌ماگره‌وی؛ بنه‌ماخوازی؛ باوه‌ڕ به پێویستی گه‌ڕانه‌وه بۆ سه‌ر بنه‌ماگه‌لی کۆن و سه‌ره‌تایی دین و شوێن‌که‌وتنی: **بنیادگرایی**

**اصولی** / 'usûlî, osûlî/: [عربی] صفت. بنه‌مایی؛ بناوانی؛ بناخه‌دار.

**اصیل** / 'asîl/: [عربی] صفت. ١. هه‌یلاو؛ ڕه‌سه‌ن؛ گران؛ ئاده‌ر؛ جسن؛ جانه‌دان؛ حدود؛ به نژادی چاک ‹اسب اصیل: ئه‌سپی ڕه‌سه‌ن› ٢. ڕه‌چه‌ڵه‌کدار؛ به‌بناوان؛ ڕه‌گه‌ز چاک؛ نه‌جیم؛ ڕه‌سه‌ن؛ خاوه‌ن تۆره‌مه (دایک و باب یان کالان)ی به‌ڕێز و به ئابڕوو ‹خانواده‌ی اصیل: بنه‌ماڵه‌ی به‌بناوان› ٣. جێ‌که‌وتوو؛ دامه‌زراو؛ خۆگرتوو؛ خاوه‌ن ئاکار یان بیری سه‌ربه‌خۆ و شیاو.

**اصیلزاده** / 'asîlzāde، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕه‌سه‌ن؛ بنه‌چه‌دار؛ نه‌جیمزاده؛ خاوه‌ن تۆره‌مه یان نژادی چاک.

**اضافات** / 'ezāfāt/: [عربی]/اسم. ١. جمعِ ☜ **اضافه** ٢. ئه‌و پاره وا مووچه‌خۆر ـــ زیاد له مووچه‌که‌ی ـ ده‌ستی ده‌گرێ.

**اضافه**[1] / 'ezāfe، ـها؛ اضافات/: [عربی]/اسم. ١. زیاد؛ زیا؛ بێژ؛ زۆر؛کار یان ڕه‌وتی زیادکردنی شتێ به شتێکی‌تر ‹قدری به این طرف اضافه کن تا برابر شوند: بڕێ به‌م لا زیاد که تا ڕێک بن› ٢. [دستور] ناوێک دانه پاڵ ناوێکی‌تره‌وه (وه‌ک : باغ بهشت: باخی به‌هه‌شت).

◻ **اضافه شدن:** زیاد بوون؛ زۆرتر بوون؛ فره بوون؛ پتر بوون. هه‌روه‌ها: **اضافه کردن**

**اضافه**[2]: صفت. سه‌ربار؛ سه‌ره‌ڕا؛ زیاده؛ زیادله؛ زێده؛ زیاده له‌وه ‹پول اضافه: پاره‌ی سه‌ربار›.

**اضافه**[3]: قید. زۆرتر؛ زیادتر؛ زێده‌تر؛ زیاده؛ فره‌تر ‹صد تومان هم اضافه می‌دهم: سه‌د تمه‌نیش زۆرتر ده‌ده‌م›.

**اضافه‌بار** / 'ezāfebār، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. سه‌ربار؛ نێوبار؛ ناوبار؛ ناڤبارک؛ ناوتا؛ ناڤبار؛ ناوکۆ؛ زێده‌بار؛ نرۆدک؛ زێده باری که ده‌خرێته سه‌ر باران.

**اضافه‌حقوق** / 'ezāfehoqûq, -huqûq، ـها/: [عربی]/اسم. ئه‌و پاره که دوای ماوه‌یه‌ک بۆ کارگێڕ زیاد ده‌کرێ.

**اضافه‌کار** / 'ezāfekār، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. سه‌رکار؛ زێده‌کار؛ کاری زۆرتر له‌وه‌ی بڕیار دراوه.

**اضافه‌کاری** / ezāfekārî' ، ــها/: [عربی/ فارسی] /اسم. زێده‌کاری؛ سه‌رکاری؛ مزه‌یێک که به جێگه‌ی زێده‌کاری وه‌رئه‌گیرێت یان ئه‌درێت.

**اضافی** [1] / ezāfî' ، ــها/: [عربی] صفت. /گفتاری/ زیادی؛ زیاده؛ ناپێویست ‹ما جای اضافی نداریم: ئێمه جێی زیادیمان نیه›.

**اضافی** [2]: قید. /گفتاری/ زێده؛ زیادی؛ زیاده؛ زۆری؛ زێده‌یی؛ فرێتر؛ فره‌تر؛ فره‌تەر؛ فریه‌تر ‹آقا، اضافی سوار نکن: کاکه، زیده سوار مه‌که›.

**اضحی** / azhā'/: [عربی] ☜ عیدقربان، **عید**

**اضداد** / azdād'/: [عربی] /اسم. ۱. جمعِ ☜ **ضِد** [1] ۲. دژ؛ دوو یا چه‌ن توخم یان ماک که له‌گه‌ڵ یه‌ک نایانکرێ (وه‌ک رۆژ و شه‌و).

**اضرار** / ezrār'/: [عربی] /اسم. /ادبی/ زیان پێگه‌یاندن؛ زه‌رەر لێدان؛ کاره‌ره‌هاتی زه‌ره‌رگه‌یاندن.

**اضطراب** / ezterāb' ، ــها؛ ـات/: [عربی] /اسم. ۱. دڵخورتی؛ هه‌له‌به‌ل؛ دڵه‌خورپێ؛ دڵه‌ڕاوکێ؛ هه‌ژقین؛ ڤا؛ ڕاچه‌نیوی؛ په‌رۆشی؛ په‌شۆکانی؛ په‌شێوی؛ شێویان و که‌وتنه دڵه‌خورپێ؛ بار و دۆخێک که به‌هۆی په‌رێشانی زه‌ینه‌وه، له‌گه‌ڵ ناره‌حه‌تی و که‌سه‌ردا رووده‌کاته دڵ و ده‌روونی که‌سێکه‌وه ‹اضطراب نداشته باش، چیزی نیست: دڵخورتیت نه‌بێ، شتێ نیه› ۲. /روان‌شناسی/ په‌رێشانی زه‌ینی به‌هۆی ترسێکی نه‌ناسراو و هه‌ستی بێده‌ره‌تانی له‌گه‌ڵ دڵه‌کوتێ و هه‌ناسه‌سواری و گیرانی گه‌رووادا.

▣ **اضطراب خاطر**: دڵخورتی؛ بیرئاڵۆزی؛ په‌رۆشی ره‌وانی؛ دڵ‌په‌شێوی.

▣ **اضطراب داشتن**: دڵخورت بوون؛ هه‌له‌به‌ل بوون.

**اضطراب‌آور** / ezterābāvar'/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕاچڵه‌کێن؛ په‌رۆشکه‌ر؛ نیگه‌ران‌که‌ر؛ هۆی په‌یدابوونی دڵخورتی و په‌رێشانی.

**اضطرار** / ezterār'/: [عربی] /اسم. /ادبی/ ناچاری؛ بێده‌ره‌تانی؛ مه‌جبووری ‹در حالت اضطرار دست به دامن این و آن شد: له سه‌ر ناچاری، ده‌س به دامێن ئه‌م و ئه‌و بوو›.

**اضطراراً** / ezterāran'/: [عربی] قید. ناچار؛ له ناچاری؛ له رووی ناچاریه‌وه؛ به ناچاری؛ له سه‌ر ناچاریه‌وه ‹اضطراراً به زیر پل پناه برد: له ناچاری په‌نای برده ژێر پرده‌که›.

**اضطراری** / ezterārî'/: [عربی] صفت. ناچاری؛ له‌مه‌جبووری؛ له‌ناچاری؛ بار و دۆخ و چۆنیه‌تی بێ ده‌ره‌تان بوون.

**اضعاف** / az'āf'/: [عربی] /اسم. ۱. جمعِ ☜ **ضِعف** ۲. چه‌ند ئه‌وه‌نده؛ چه‌ن‌جاره؛ چه‌ن به‌رابه‌ر؛ چه‌ن ئه‌وه‌نه ‹۳۲ اضعاف ۲ است: ۳۲ چه‌ند ئه‌وه‌نده‌ی ۲یه›.

**اضلاع** / azlā''/: [عربی] جمعِ ☜ **ضِلع**

**اضمحلال** / ezmehlāl'/: [عربی] /اسم. /ادبی/ لێک‌هه‌ڵوه‌شاوی؛ هه‌ڵوه‌شاوی؛ ڕه‌وتی له به‌ین چوون؛ له ناو چوون ‹با فرار شاه، نظام شاهنشاهی دستخوش اضمحلال شد: به هه‌ڵاتنی شا، ده‌زگای پاتشایه‌تی تووشی لێک‌هه‌ڵوه‌شاوی هات›.

**اضو** / ozû'/: [عربی] صفت. ڕووگرژ؛ ناچاوترش؛ مرومۆچ؛ مرومۆن؛ گه‌مۆر؛ مۆڕ؛ مچ.

**اطاعت** / etā'at'/: [عربی] /اسم. گوێداری؛ گوێڕایه‌ڵی؛ گوێ‌له‌مستی؛ فه‌رمانبه‌ری؛ فه‌رمانبه‌رداری؛ کار یان ڕه‌وتی فه‌رمانبه‌رداری و به‌جێ‌هێنانی کارێ.

▣ **اطاعت کورکورانه**: مل‌که‌چی؛ فه‌رمانبه‌رداری بێ لام و جووم.

▣ **اطاعت شدن**: فه‌رمان بردن؛ به چاوان/ سه‌رچاوگوتن ‹به راننده گفتم: راه بیفت! فوراً

گفت: اطاعت می‌شود: بە ڕانەندەکەم گوت: لێخوڕە! خێرا گوتی: بەچاوان›.

**اطاعت کردن:** مل ڕاکێشان؛ ملدان.

**اطاق** / otāq'/: [ترکی] ☜ **أتاق**

▣ **اطاق رو بە تراس:** پشتەیوان؛ پشت هەیوان؛ ئۆدەی لە ڕووی هەیوان.

**اطاق کفش کن:** پێشخانە؛ ژووری کەوشکەن بەر لە هۆدەی دانیشتن.

**ـ اطاقه** / otāqe'/: [ترکی] ☜ **ـ أتاقه۲**

**اطاله** / etāle'/: [عربی]/اسم. [ادبی] درێژە؛ کاری درێژە پێدان.

▣ **اطالەی کلام:** زۆربێژی؛ فرەوێژی؛ درێژدادڕی.

**اطالەی لسان:** ۱. زۆربلێیی؛ فرەوێژی؛ وڕاجی ۲. زماندرێژی؛ دەم درێژی؛ چەنەبازی؛ چەنەڕوویی.

**اطبا** / atebbā'/: [عربی] جمعِ ☜ **طَبیب**

**اطراف** / atrāf'/: [عربی]/اسم. ۱. پەڕانپەڕ؛ پەگاڵ؛ دەوراندەور؛ دەور و پشت؛ چوار لا؛ چواردەورە؛ هاوێدۆر؛ هاویردۆر؛ دەور و بەر؛ هەموو لایەکی شتێ یان کەسێک ‹در اطراف باغ درخت بادام کاشته بودند: لە پەڕانپەڕی باخەکە داری بادامیان چاندبوو› ۲. دەوروبەر؛ ئەملا و ئەولا؛ کەراخ‌بێچاخێ؛ قەراخ‌وبیجاخ؛ کەنارە و کەنار؛ دەرەوە؛ ئی‌لا و ئەولا ‹رفته بود اطراف را بگردد: چووبوو دەوروبەر بگەڕێ›.

**اطراف‌واکناف** / atrāf-o-'aknāf'/: [عربی] اسم. [ادبی] دوور و نزیک؛ هەڤیرکە؛ کەراخ بێچاخێ؛ قەراخ‌وبیجاخ؛ ئالی؛ هێل؛ دەوروبەر؛ هەموو قوژبن و لێوارەکانی جێگایەک.

**اطرافی** / atrāfī'/: [عربی] صفت. لاوەکی؛ دەرەکی؛ بیانی؛ بەتایبەت هی لادێ یان شاری نێزیک.

**اطرافیان** / atrāfiyān'/: [عربی]/اسم. نزیکان؛ کەس و کار؛ خزم و کەسان؛ لێزمان؛ مێر و چێر؛ دەوروبەریگەل؛ کەسانی نزیک ‹اطرافیان شاه، اغلب نادرست بودند: نزیکانی شا زۆربەیان چەوت بوون›.

**اطراق** / otrāq'/: [ترکی] ☜ **أتراق**

**اطعام** / et'ām'/: [عربی]/اسم. نان‌بدەیی؛ کار و ڕەوتی نان دان؛ خواردەمەنی دان.

▣ **اطعام مساکین:** نان دان بە هەژاران؛ خواردەمەنی بەخشین بە نەداران.

▣ **اطعام شدن:** خواردەمەنی گرتن؛ گرتنی چێشت.

**اطعام کردن:** نان دان؛ خواردەمەنی دان؛ چێشت دان.

**اطعمه** / at'ame, 'at'eme'/: [عربی] جمعِ ☜ **طَعام**

**اطفا** / etfā'/: [عربی]/اسم. داکوژێنی؛ کار و ڕەوتی کوژاندنەوە؛ کوژانن؛ قوژانن؛ تەمراندن؛ ڤەمراندن؛ کوشنایوە؛ ئەوەکوشنەی؛ خامۆش کردن.

▣ **اطفای حریق:** کوژاندنەوەی ئاگر.

**اطفائیه** / etfā'īyye'/: [عربی]/اسم. [قدیمی] ئاگرکوژێنەر؛ بنکەی ئاگرکوژاندنەوە.

**اطفال** / atfāl'/: [عربی] جمعِ ☜ **طِفل**

**اطلاع** / ettelā'/، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. خەبەر؛ ئاگەداری؛ ئاگاداری؛ ئاگا؛ هاگا؛ زانیاری؛ های؛ هایی؛ هالا؛ جەی؛ سال ‹هیچ اطلاعی در دست نیست: هیچ ئاگادارییەک نیە›.

▣ **اطلاع دادن:** خەبەردان؛ ڕاگەیاندن ‹سلامت خود را اطلاع دهید: ساغی خۆتان ڕاگەیەنن›.

**اطلاع داشتن:** ئاگا لێبوون؛ خەبەر لێبوون؛ هاژێ بوون.

**اطلاع یافتن:** ئاگادار بوون؛ خەبەردار بوون.

**اطلاعات** / ettelā'āt'/: [عربی]/اسم.

ئاگـــەداری؛ ئاگـــاداری: ۱.خەبـــەر و باســـی سەبارەت بە جوولانەوەی هێزی دوژمن یا ناکۆکیگـەلی رامیـاری، کـە بـە شـێوازێکی نهـێنی دەس‌کـەوتبـێ ۲. بـەشـێ لـە دامـەزراوەیـەک کـە بـە مـەبـەستی ئاگـادار کـردنی کـەسانێ کـە هـات‌وچـووی ئـەوێ دەکەن دابین‌کراوە ۳. زانیاری.

▣ **اطلاعات آماری:** ئاگاداری ژمێرکۆ.

**اطلاعـات اداره:** نقیـسگە؛ پرسـگە لـە دام و دەزگای میریدا.

**اطلاعـات محرمانـه:** خـەبـەری نهـێنی؛ ئاگاداری نهێنی.

▣ **اطلاعـات داشـتن:** هـای لـێ‌بـوون؛ ئاگـا لـێ‌بـوون. هـەروەهـا: **اطلاعـات دادن؛ اطلاعات گرفتن**

**اطلاعـــاتی** / 'ettelā'ātî/: [عربـی] صـفت. ئاسایـشی: ۱. سـەر بـە ئاسایـشی گـشتی ۲. /ـها/ ئەندامی بنکەی ئاسایشی گشتی.

**اطـلاع‌رسـانی** / 'ettelā'resānî, ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/اسم. ۱. راگـەیێنـەری؛ کـار یـا رەوتی راگـەیانـدنی ئاگاداریـەل ۲. زانـستی کـۆ کردنـەوە، لێکۆڵـینەوە و بلاوکردنـەوەی ئاگاداریگەل.

**اطلاعیـه** / 'ettelā'îyye, ـهـا/: [عربـی]/اسم. دەڤـلی؛ هـای؛ خـەبـەرداری؛ بـەلاڤـۆک؛ ئاگـاداری: ۱. خـەبـەرێـک کـە لـە لایـەن هـەواڵـنێری گـشتیەوە رادەگـەیـەنـدرێت ‹اطلاعیـەی دولـت از رادیـو خوانـده شـد: دەڤـلی دەوڵـەت لـە رادیـۆوە خوێندرایـەوە› ۲. لاپەڕەیەک، کـە بـۆ ئاگـا کـردنی کـەسێک لـە شـتێک بـۆی دەنێردرێـت ‹اطلاعیـەی بانـک: ئاگـاداری بانـگ› ۳. لاپـەڕەگـەلێـک کـە لـە بوارێکی دیـاریکراودا بـۆ ئاگـاداری گـشتی بـلاو دەکرێتـەوە ‹اطلاعیـەی مربـوط بـە حـوادث اخیـر دانشگاه: ئاگـاداری سـەبـارەت بـە ڕووداوەکـانی ئـەم دوایییەی زانستگا›.

▣ **اطلاعیـەی نظـامی:** دەڤـلی چـەکـداری؛ ئاگاداری چەکداری.

**اطــلاق** / 'etlāq/: [عربـی]/اسم. کـار و ڕەوتی ناو لێنان؛ ناونان؛ ناڤبرن.

▣ **اطـلاق کـردن:** ناونـان؛ بـە ناوێـک بانـگ کـردن؛ ناوێـک بـە کـەسێک یـان شـتێکەوە نان. هەروەها: **اطلاق شدن**

**اطلس** / 'atlas/: [معرب از یونانی] ☜ **آتلَس**

**اطلـــسی** / 'atlasî/: [معـرب از یونـانی] ☜ **آتلَسی**

**اطمینـان** / 'etmînān/: [عربـی]/اسم. دڵـنیایی؛ ئارخەیـانی؛ خاترجـەمـی؛ بـێ‌خـەمـی؛ ئێتـوار؛ متمانـە؛ بـڕوایی: ۱. دۆخ یـان حاڵـەتی زەیـنی لە نەبوونی گومـان لـەمـەڕ دروسـتی هـەواڵ یـا بـاوەڕێـک ‹عمـو حسین بـە صـندوقدارش اطمینـان داشت: مامە حوسەیـن لـە دەخـڵدارەکـەی دڵـنیایی هـەبـوو› ۲. خاترجـەمـی بـە هـۆی بـاوەڕ بـە شـتێک ‹دکتـر بـە مـن اطمینـان داد: دوکتـور دلنیایی پێدام› ۳. یـەقـین ‹بـە درست بـودن این خبـر اطمینـان داری؟: لـە دروسـت بـوونی ئـەم هەواڵە دلنیاییت هەیە ؟›.

▣ **اطمینـان خـاطر:** دڵ‌قـایمی؛ دڵـنیایی؛ ئارخەیانی؛ خاترجەمی.

▣ **اطمینان بخشیدن** ☜ **اطمینان دادن**

**اطمینان حاصل‌کردن** ☜ **اطمینان یافتن**

**اطمینـان دادن:** هـەدنانـدن؛ کـەسـاندن؛ دلنیاکردن؛ خاترجەم‌کردن.

**اطمینـان داشـتن:** ۱. بـڕوا/ بـاوەڕ پـێ بـوون؛ ئێتوار پێ‌کردن ۲. خاترجەم بوون.

**اطمینان کردن:** دڵنیا بـوون؛ بـڕوا پـێ کـردن؛ ئێتوار پێ‌کردن؛ باوەر پنەکەردەی.

**اطمینـان یـافتن:** دڵـنیا بـوون؛ خاترجـەم بوون: **اطمینان حاصل کردن**

**اطمینـــان‌بخـــش** / 'etmînānbaxš/: [عربـی/

فارسی] صفت. ئارخەیاندەر؛ دڵنیاکەر؛ دڵدامەزرێن.

**اطناب** / etnāb'/: [عربی]/اسم. [ادبی/ ۱. زۆربڵێیی؛ زۆر بێژی؛ فرەبێژی؛ درێژدادڕی؛ فرەوێژی؛ فرپێژی ۲. کار یان ڕەوتی ڕەقاندنەوە؛ فرە وتن، قسەی زۆرکردن.

◘ **اطناب مَمِل**: فرەوێژی؛ زۆربڵێیی؛ زۆربێژی؛ زۆرگوتنێ کە ببێتە هۆی وەڕەز بوونی گوێگر یان تێکچوونی مەبەست.

**اطو** / utû, 'otû'/: [ترکی] ☜ **أتو**

**اطوار** / atvār'/: [عربی]/اسم. ۱. [نامتداول] جمعِ ☜ **طَور** ۲. /ها/ ئەتوار؛ ئاکار ۳. /ها/ [کنایی] ناز و نووز؛ ئاین‌وئۆین؛ ئاکاری نائاسایی و نەگونجاو (زۆرتر بۆ ژنان).

◘ **اطوار آمدن/ ریختن**: ناز و نووزکردن؛ خرنگە-خرنگ‌کردن؛ ئەتوار ڕشتن.

**اطواری** / atvārî'/ ـها/: [عربی] صفت. تیتاڵباز؛ ناز و نووزکەر.

**اطول** / atval'/: [عربی] صفت. [ادبی] درێژتر.

**اظهار** / ezhār'/: [عربی]/اسم. ۱. کار یا ڕەوتی دەرخستن؛ نواندن؛ پیشاندان؛ ئاشکرا کردن؛ ئرمانەی ‹اظهار وجود: خۆ نواندن› ۲. دەربڕین؛ گوتن؛ وتن؛ واتەی ‹اظهار عقیده: دەربڕینی بیر و باوەڕ›.

◘ **اظهارخرسندی**: خۆشی نیشاندان؛ شادی دەربڕین.

**اظهار عقیده** ☜ **اظهار نظر**

**اظهار فضل**: خۆنوێنی؛ زانایی خۆ بە چاودان.

**اظهار نظر**: ڕا دەربڕین؛ دەربڕینی بیر و ڕا: **اظهار عقیده**

◘ **اظهار امتنان کردن**: سپاس‌کردن.

**اظهار داشتن/ کردن**: ئاشکراکردن؛ گوتن؛ دەربڕین؛ دەی بەر. هەروەها: **اظهار شدن**

**اظهار وجود کردن**: [مجازی] خۆ نواندن؛ خۆ پیشاندان؛ وێ دەی بەر؛ وێ ئرمانەی؛ نیشاندانی کارامەیی و توانایی ڕاستەقینەیی یان درۆیینەیی خۆ.

**اظهارات** / ezhārāt'/: [عربی]/اسم. وتەگەل؛ قسەگەل ‹اظهارات نمایندگان: وتەکەلی نوێنەران›.

**اظهارنامه**/ ezhārnāme'، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. وەرەقە یان هۆیەکی یاسایی بۆ دەربڕینی وتارێک: **اظهاریه**

**اظهاریه** / ezhārîyye'/: [عربی] ☜ **اظهارنامه**

**اظهرمن‌الشمس** / azharomenaššams'/: [عربی] صفت. وەک ڕۆژ ڕۆشن؛ وەک ڕۆژی ڕوون؛ لە ڕۆژ ئاشکراتر؛ زۆر ڕوون ‹این دیگر اظهر من‌الشمس است: ئەمە ئیتر وەک ڕۆژ ڕوشنە›.

**اعاده** / e'āde'/: [عربی]/اسم. ۱. کار یان ڕەوتی گەڕاندنەوە؛ گێڕانەوە؛ پێدانەوە؛ ناردنەوە ۲. دووپات؛ دوپاتی؛ دیسان وتنەوە ‹اعادەی سخن: دووپاتی قسە›. هەروەها: **اعاده دادن؛ اعاده شدن؛ اعاده کردن**

◘ **اعادەی حیثیت**: ئابڕوو سەندنەوە؛ ئابڕوو کڕینەوە.

**اعادەی دادرسی**: پێدا چوونەوە؛ بڕیار دانەوە؛ لەسەرڕا چوونەوە بەسەر بەڵگەگەلی پەروەندەیەکدا کە پێشتر بڕیاری دراوە و تەواو بووە، بەڵام بە هۆی هەڵەیێکەوە کە دەیدەنە پاڵی، یان دەرفەتێک کە بەپێی قانوون هەیە، داوای دیسان پیێدا چوونەوەی دەکرێ.

**اعاشه** / e'āše'/: [عربی]/اسم. [ادبی] ژیان؛ ژین؛ ژیوار؛ گوزەران؛ کار یان ڕەوتی قەرقەدانەدن؛ ژیوەی؛ بەسەر بردنی ژیان ‹اعاشه از طریق تکدی، خطا است: ژیان لە ڕێگەی سوالکەریەوە، هەڵەیە›.

**اعاظم** / a'āzem'/: [عربی]/اسم. [ادبی]

گەورەگەل؛ مەزنان؛ مازنان؛ هێژایان؛ گراگران.

**اعانات** / e'ānāt/: [عربی] جمعِ ☜ **اعانه**

**اعانه** / e'āne/، ـها؛ اعانات/: [عربی]/اسم. یارمەتی؛ باربوو؛ ئانە؛ هەشکبەر؛ باربوو بۆ یاریدەی هەژاران ‹گردآوری اعانه برای سیل‌زدگان: کۆکردنەوەی یارمەتی بۆ لافاولێداوان›. هەروەها: **اعانه دادن؛ اعانه گرفتن**

**اعتبار** / e'tebār/: [عربی]/اسم. بڕ؛ قورساغ؛ وەج و ڕێز؛ هورم؛ جێ‌باوەڕی: ۱. گیر؛ بایەخ ‹اعتبار این حواله تا فرداست: بڕی ئەم حەوالە تا بەیانیە› ۲. جێگەی بڕوا؛ گیر ‹حرفهای او اعتبار ندارد: قسەکانی بڕیان نیە› ۳. گووژمەی تەرخان‌کراو لە بووجە بۆ لایەنێکی دیاریکراو ‹اعتبار کشاورزی: بڕی کشت‌وکاڵ›.

◙ **اعتبار بانکی:** هورمی بانکی؛ پەسەند.

**اعتبار متحرک/ گردان:** [حسابداری] بەعی؛ پارەیەک کە لە سەر حیساب دەدرێتە دەست کارگێڕەوە تا کارەکانی پێ جێبەجێ کات، پاشان ڕاست بکرێتەوە.

◙ **اعتباربخشیدن/ دادن:** گەورەکردنەوە؛ پلەوپایە پێدان. هەروەها: **اعتبار داشتن**

**اعتبار داشتن:** ۱. خاوەن بەڵگە بوون ۲. جێ بڕوا بوون؛ شیاوی بڕوا پێ‌کردن هەبوون.

**اعتبار کردن:** باوەڕ پێ‌کردن؛ بڕوا پێ‌کردن؛ ئێتوار پێ‌کردن ‹اعتبار نمی‌کنم، مغازه را به او بسپارم: باوەری پێ ناکەم، دووکانەکەی پێ بسپێرم›.

**از درجەی اعتبار ساقط شدن:** لە هورم کەوتن؛ بڕ نەمان.

**اعتبارنامه** / e'tebārnāme/، ـها/: [عربی/فارسی]/اسم. بڕوانامە؛ باوەڕنامە: ۱. [بانکداری] نووسراوەیەک کە بانک بە کڕیاری ئەدات تا هورمی لە لای یەکێ لە نوێنەرانیەوە بسەلمێنێ ۲. نامەیەک کە تێیدا دروستی هەڵبژاردنی نوێنەرێک لە لایان ئەوانەوە وا هەڵیانبژاردووە، سەلمێندراوە.

◙ **اعتبارنامەی سیاسی:** بڕاوانامەی ڕامیاری.

**اعتباری** / e'tebārî/: [عربی] *صفت*. بڕوایی؛ هورمی؛ جێ‌باوەڕی.

**اعتدال** / e'tedāl/: [عربی]/اسم. هاوسانی: ۱. بار و دوخ یان چۆنیەتی مام‌ناونجی بوون ‹اعتدال هوا: هاوسانی هەوا› ۲. هاوسەنگی ‹اعتدال در زندگی: هاوسانی لە ژیاندا› ۳. بەرامبەری درێژایی شەو و ڕۆژ لە ناوچەیەکدا ‹اعتدال بهاری: هاوسانی بەهارە›.

◙ **اعتدال بهاری:** ڕۆژگەڕانەوە؛ هاوسانیی بەهارە؛ یەکەم ڕۆژی خاکەلێوە کە لەو کاتەدا شەو و ڕۆژ بەرامبەر دێنەوە: **اعتدال ربیعی**

**اعتدال پاییزی:** شەوگەڕانەوە؛ هاوسانیی پایزە؛ یەکەم ڕۆژی ڕەزبەر (یان ۳۱ی خەرمانان) کە لەو کاتەدا درێژی شەو و ڕۆژ بەرامبەرە: **اعتدال خریفی**

**اعتدال خریفی** ☜ **اعتدال پاییزی**

**اعتدال ربیعی** ☜ **اعتدال بهاری**

**اعتدال مزاج:** تەندروستی؛ ساغی؛ لەش‌ساغی؛ بێ‌وەیی؛ ساخلەمی.

**اعتدال هوا:** هاوسانی هەوا؛ فێنکی؛ هینکاتی؛ نەگەرم و نەساردی هەوا.

**اعتدالی** / e'tedālî/، ـها؛ ـان؛ ـون/: [عربی] *صفت*. *[سیاست]* مام‌ناوندی؛ میانەڕەو؛ نە زۆر توند و نە زۆر شل لە کاردا.

**اعتذار** / e'tezār/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* لێبووردن‌خوازی؛ داوای لێبوردوویی؛ کار یان ڕەوتی داوای بەخشش کردن.

**اعتراض** / e'terāz/، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. بەرتەک؛ بەرهەڵستی؛ پێشبڕی؛ لێ

ڕابوونی؛ بەرپەرچ دانەوە: ١. کردەوەیەکی بەرهەڵستانە سەبارەت بە ئاکار و وتاری کەسێک ‹سخنان ناطق موجب اعتراض حاضران شد: قسەکانی بێژەرەکە بوو بە هۆی بەرتەکی دانیشتووان› ٢. کار یان ڕەوتی گوتن یا پیشاندانی نارازی بوون لە بار و دۆخێک کە هەیە ٣. *[مجازی]* بەرتەک‌نامە؛ لێوەرگەڕانی.

▣ **اعتراض کردن**: هەڵوێست نواندن؛ نارەزایی دەربڕین؛ سەر بادان؛ گازندە کردن؛ لە بەر هەڵوەستان؛ لێ ڕابوون؛ لێقەگەریان؛ لێوەستان. هەروەها: **اعتراض دادن؛ اعتراض داشتن**

**اعتراض آمیز** / e'terāzāmîz/: [عربی/ فارسی] *صفت*. بە پەرچ و تەگەرە؛ بە بەرتەکەوە؛ بە پێشبڕیەوە.

**اعتراضنامه** / e'terāznāme/، ـها/: [عربی/ فارسی] */اسم*. بەرتەک‌نامە؛ بەرهەڵست‌نامە؛ هەر نامەیەکی سەبارەت بە لێگری و پێشبری.

**اعتراضیه** / e'terāzîyye/، ـها/: [عربی] */اسم*. بەرتەک‌نامە؛ نامەی نارەزایی دەربڕین.

**اعتراف** / e'terāf/، ـها؛ ـات/: [عربی] */اسم*. دان‌پیدانان؛ ڕاستی گوتن؛ موکڕی؛ قسە ئاشکراکردن؛ دەرڤەدان: ١. دەربڕین و بە ئەستۆ گرتنی تاوان و هەڵە ‹اعتراف متهم به قتل، در پرونده ثبت شد: دان پیدانانی تاوانبارکراو بە کوشتن، لە پەروەندەدا نووسرا› ٢. ئاگادارییەک کە لە سەر ناچاری ئەگوترێت ٣. *[کلیسا]* هەڵدانی گوناحگەلی خۆ، لای کەشەوە ❊ **اقرار**

▣ **اعتراف گرفتن**: پێ هاوردن؛ پێ درکاندن. هەروەها: **اعتراف کردن**

**اعترافنامه** / e'terāfnāme/، ـها/: [عربی/ فارسی] */اسم*. نووسراوەیەک کە تێیدا کەسێ دان دەنێ بەو کارە ناڕەوایانەدا کە کردوونی.

**اعترافنیوش** / e'terāfnyûš/، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] */اسم*. مکوڕی‌بیس؛ ئەو کەسەی (وەک کەشە یان ئۆسقوف) کە فەلەکان لە کلێسە، لە بەرانبەریدا سووچ و گوناحی خۆیان هەڵدەدن: **اقرارنیوش**

**اعتزالی** / e'tezālî/: [عربی] *صفت*. ئیعتزالی؛ پێوەندیدار یان سەر بە موعتەزەلەوە.

**اعتصاب** / e'tesāb، ـها؛ ـات/: [عربی] */اسم*. مان؛ هۆک؛ گە؛ بەس؛ لان؛ دەرۆم؛ گریڤ؛ جەنە؛ کە؛ گەی؛ گڕنە؛ ماهنە؛ غەرز؛ پێ‌چەقانی؛ مەنەر؛ گروو: ١. وەستانەوە لە هەر کارێک بۆ نیشانیدانی نارەزایەتی ‹اعتصاب غذا: مان گرتن لە خواردن› ٢. کار و ڕەوتی دەست لە کار کێشانەوەی کرێکاران یان کارمەندان بە مەبەستی گوشار هاوردنە سەر بەرپرسان و لێپرسراوان. هەروەها: **اعتصاب کردن**

▣ **اعتصاب سیاسی**: مانی ڕامیاری؛ مان گرتنی سیاسی.

**اعتصاب صنفی**: مانی پیشەیی؛ مان گرتنی پیشەیی.

**اعتصاب عمومی**: مانی گشتی؛ گرووی گشتی.

**اعتصاب غذا**: مان لە خواردن؛ مان گرتن لە خواردن.

**اعتصاب کارگری**: مانی کاریگەری؛ مان گرتنی کارگەری.

**اعتصاب کلیدی**: مانی سەرەکی.

**اعتصاب‌شکن** / e'tesābšekan/، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] */اسم*. مان شکێن؛ کەسێ کە بە دژی ڕای زۆربەوە دەوەستێ و لە مان گرتندا بەشداری ناکا.

▣ **اعتصاب کردن**: مان گرتن؛ هەڕنین؛ هەڕمین؛ خەزرین؛ هۆک کردن؛ گە گرتن؛ خەنزرین؛ جەنە گرتن.

**اعتصابی** / e'tesābî', ـها؛ ـان؛ ـون/: [عربی] صفت. مانگرتوو؛ گەگرتوو؛ هۆکن ‹کارگران اعتصابی: کاریگەرانی مانگرتوو›.

**اعتقاد** / e'teqād/: [عربی]/اسم. باوەڕ؛ باوڕ؛ باوەر؛ بڕوا: ۱. بار و دۆخ یان چۆنیەتی بڕوا پێ بوون ‹او اعتقاد داشت این کار بی فایده است: ئەو بڕوای وا بوو ئەم کارە بێ‌کەڵکە› ۲. /ـها؛ ـات؛ معتقدات/ باوەڕی؛ بڕواگەل ‹اعتقاد مردم را نباید مسخره کرد: بڕوای خەڵکی نابێ بە گاڵتە بگیردرێ›. هەروەها: **اعتقاد داشتن؛ اعتقاد یافتن**

**اعتقادنامه** / e'teqādnāme، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. بڕوانامە؛ باوەڕنامە؛ کتێب یان نووسراوەیەک کە ڕێوشوێنی ڕێبازێ یان حێزبێکی تێیدا نووسراوە.

**اعتقادی** / e'teqādî/: [عربی] صفت. بڕوایی؛ باوەڕی ‹اصول اعتقادی: بنەماگەلی بڕوایی›.

**اعتکاف** / e'tekāf/: [عربی]/اسم. خەڵوەگری؛ خەڵوەنشینی؛ دوورەپەرێزی لە خەڵک، بە تایبەت بۆ عیبادەت.

**اعتلا** / e'telā/: [عربی]/اسم. /ادبی/ سەرکەوتی؛ بڵیندی؛ پێشکەوتی؛ هەراشی؛ پێهەلی؛ کار یان ڕەوتی سەرکەوتن ‹تلاش جوانان ما موجب اعتلای کشور خواهد شد: تێکۆشانی لاوانی ئێمە دەبێتە هۆی سەرکەوتنی وڵات›.

⊡ **اعتلا یافتن:** سەرکەوتن؛ بانتر چوون؛ گەشە ساندن؛ پێشقە چوون؛ ژێهەڵچوون؛ پێشکەوتن؛ بەرز و بڵند بوونەوە.

**اعتماد** / e'temād/: [عربی]/اسم. بڕوا؛ ڕابینی: ۱. کار یان ڕەوتی بڕوا پێکردن؛ بڕوا بە دروستکاری، ڕاستبێژی یان کارامەیی کەسێک ‹او به همکارانش اعتماد داشت: ئەو بڕوای بە هاوکارەکانی بوو› ۲. باوەڕی؛ ڕەوت و چۆنیەتی ڕکان؛ ڕاپەرمان؛ تێڕادیوی؛ ڕاپەرموون؛ پەرمان؛ پشت پێبەستن لە سۆنگەی ئەم باوەڕەوە ‹من به اعتماد تو او را استخدام کردم: من بە ڕاپەرمانی تۆوە ئەوم دامەزراند›. هەروەها: **اعتماد داشتن؛ مورد اعتماد بودن**

⊡ **اعتماد کردن:** ڕابینین؛ بڕوا/ باوەڕ پێکردن؛ ڕاپەرموون؛ ڕاپەرمان؛ پەرمان؛ پەرمیان؛ پەرمەی؛ پشت پێ گرێدان.

**اعتمادبنفس** / e'temādbenafs/: [عربی]/اسم. بەخۆدا پەرمی؛ دەخۆڕا بینی؛ لەڕووهاتی؛ بڕوا بە خۆیی؛ ڕەوتی بەخۆدا پەرمیان.

**اعتنا** / e'tenā/: [عربی]/اسم. کاری ئاوڕدانەوە؛ لاکردنەوە ‹به چراغ قرمز اعتنا نکرد: ئاوری لە چرا سوورەکە نەداوە›.

**اعتیاد** / e'tîyād، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. گیرۆدەیی؛ هوکارەیی: ۱. ڕەوتانەی دەق پێوەگرتن ‹اعتیاد به خواندن روزنامه: گیرۆدەیی بە ڕۆژنامە خوێندنەوە› ۲. /پزشکی/ دۆخێک کە لە بەکارهێنانی بەردەوام و پەساپەسای بڕێ شت بەدی دێت کە گەلێک گرفتی مەترسیداری بە دواوەیە. هەروەها: **اعتیاد داشتن**

**اعجاب** / e'cāb/: [عربی]/اسم. /ادبی/ سەرسووڕماوی: ۱. سەرسووڕی؛ سەرزقڕیان ‹پشتکار او مایەی اعجاب بود: پشتکاری هۆی سەرسووڕمان بوو› ۲. سەیرمان ‹با کارهایش اعجاب همه را فراهم ساخت: بەو کارانەی بوو بە هۆی سەرسووڕمانی هەمووان›.

**اعجاب‌انگیز** / e'cābangîz/: [عربی/ فارسی] صفت. سەیر؛ سەرسووڕێنەر ‹زیبایی اعجاب‌انگیز: جوانی سەرسووڕێنەر›.

**اعجاب‌آور** / e'cābāvar/: [عربی/ فارسی] صفت. سەرسووڕێنەر ‹تلاش اعجاب‌آور: تێکۆشانی سەرسووڕێنەر›.

**اعجـاز** / 'e'câz/: [عربـی]اسـم. [ادبـی] کـاری دژوار؛ کـاری ئاریـشه؛ کـاری سـهیـر و سەمەرە.

⊡ **اعجـاز کـردن:** کـاری سـەیـر و سـەمـەرە کردن.

**اعجوبه**[1] / 'o'cûbe، ـهـا/: [عربی]اسم. بلیمـەت؛ هەڵکەوتـوو؛ کـەسێ کـە کـاری سـەیـر دەکـا، یـان تایبـەتمـەندیگـەل و تواناییگـەلی دەبێتـە هۆی سـەرسوورمانی خـەڵـکی ‹اعجوبەای بـود کـه نظیـر نداشـت: بلیمـەتێـک بـوو کـە هاوتـای نەبووە›.

**اعجوبه**[2]: صفت. ١. سـەیـر و سـەمـەرە ‹حیوان اعجوبـه: حـەیـوانی سـەیـر و سـەمـەرە› ٢. هـەڵـکەوتـوو؛ بلیمـەت ‹سیاسـتمدار اعجوبـه: رامیاری بلیمەت›.

**اعدا** / 'a'dâ/: [عربی] جمعِ ☜ **عَدو**

**اعداد** / 'a'dâd/: [عربی] جمعِ ☜ **عَدَد**

**اعـدام** / 'e'dâm، ـهـا/: [عربـی]اسـم. ئیعـدام؛ کـار یـان ڕەوتی کوشـتنی کەسـێک بـە: لـە سـێدارە دان، گولـەبـاران کـردن، یـان هـەر چـۆنێکی تـر. هـەروەهـا: **اعـدام شـدن؛ اعـدام کردن**

**اعـدامی** / 'e'dâmî، ـهـا؛ ـان/: [عربـی] صـفت. ئیعـدامی؛ سـێدارەیـی؛ قـەنـارەیـی؛ لـە سـێدارەدراو ‹نـام افـراد اعـدامی در روزنامـه منتـشر شـده بـود: نـاوی کـوژراوەکـان لـە ڕۆژنامـەدا بـڵاو ببۆوە›.

**اعراب** / 'a'râb/: [عربی] جمعِ ☜ **عَرَب**

**اعـراب** / 'e'râb، ـهـا/: [عربـی]اسـم. مـووفرک؛ سەر و ژێر و بۆر له نووسیندا.

⊡ **اعراب گذاشتن** ☜ **اعراب‌گذاری**

**اعـراب‌گـذاری** / 'e'râbgozârî، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]اسـم. مـووفرکـدانـان؛ کـار یـان ڕەوتی نووسـین یـا دیـاری‌کـردنی سـەر و ژێـری نووسراوەیەکـی عـەرەبی (یـان فارسـی): **اعـراب گذاشتن**

**اعرابـی** / 'a'râbî/: [عربـی] صـفت. [نامتـداول] عەرەب ‹جوان اعرابی: گەنجی عەرەب›.

**اعـراض** / 'a'râz/: [عربـی]اسـم. ١. جمـعِ ☜ **عَرَض** ٢. جمعِ ☜ **عِرض**

**اعـــراض** / 'e'râz/: [عربـــی]اســم. [ادبـــی] خۆبـوێری؛ دوورەپـەرێـزی؛ خۆپـارێزی؛ ڕووەرگێـری: ١. کـار یـان ڕەوتی چاوپۆشـان لە کارێک و نـەکردنـەوەی ئـەو کـارە ‹اعـراض از کـار: خۆبـوێری لـە کـار› ٢. کـار یـان ڕەوتی ڕوو وەرگـەڕانـدن و دووری گـرتن لـە شـتێک و لا لێ نـەکردنـەوەی ‹کوشـیدم بـا اعـراض از دوسـتان ناباب، خـود را اصـلاح کـنم: تێکۆشـام بـە دوورگـرتن لـە دۆسـتانی نابـاو، خـۆم دروسـت بکـەم›. هەروەها: **اعراض کردن**

**اعــــراف** / 'e'râf/: [عربـــی]اســـم. [اســـلام] بـەرزەک؛ بـەرزەخ؛ جێگـەیـەک لـە نێـوان بەهەشت و دۆزەخدا.

**اعـزاز** / 'e'zâz/: [عربـی]اسم. [ادبی] ڕێزگـری؛ کـار و ڕەوتی ڕێزنـان؛ ڕێـز لێنـان ‹در اعـزاز او کوتـاهی نکردنـد: لـە ڕێزنانـی ئـەودا کۆتاییـان نەکرد›.

**اعـزام** / 'e'zâm/: [عربـی]اسم. کـار یـان ڕەوتی نـاردران/ هـەنـاردن؛ کیاسـیەی/کیاسـتەی؛ ڕەوانـە کـران یـان کـردن (بـۆ مـرۆڤ) ‹اعـزام دانـشجو بـه خـارج از کـشور: ناردنـی خوێنـدکار بـۆ دەرەوەی وڵات›.

⊡ **اعــزام شــدن:** ڕەوانــەکــران؛ نــاردران؛ کیاسـیەی؛ کـڵ کـران ‹کـسی یـاد نـدارد حتـی یـک نفـر هـم اعـزام شـده باشـد: کـەسێ وە بـیر ناهێنێتــەوە تــەنانــەت تاقەکـەســێکیش ناردرابێ›.

**اعـزام کـردن:** نـاردن؛ هـەنـاردن؛ کیاسـەی؛ هنارتن؛ ڕەوانەکردن؛ ڤەرێکرن.

**اعزامــی** / 'e'zâmî، ـهـــا/: [عربـــی] صـــفت. گذاشتن

ناردراو؛ هه ناریاگ؛ کیاسیا؛ ره وانه کراو ‹هیئت اعزامی: دەستەی ناردراو›.

**اعسار** / a'sār/: [عربی] *اسم*. دەستەنگی؛ کەمدەسی: ۱. *[ادبی]* هەژاری؛ نەداری؛ دەسکورتی؛ تەنگدەسی؛ بێتۆکی ۲. *[حقوق]* نەبوونی توانایی بۆ دانەوەی قەرز.

**اعشار** / a'šār/: [عربی] *اسم*. ۱. جمع ☜ **عُشر** ۲. دەیان.

**اعشاری** / a'šārî، ـها/: [عربی] *صفت*. دەیانە؛ دەگانە.

▣ **کسر اعشاری** ☜ **کسر**

**اعصاب** / a'sāb/: [عربی] جمعِ ☜ **عَصَب**

**اعصار** / a'sār/: [عربی] جمعِ ☜ **عَصر**

**اعضا** / a'zā/: [عربی] جمعِ ☜ **عُضو**

**اعطا** / e'tā/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* کار و رەوتی بەخشین؛ بەشین؛ دان؛ پێدان ‹اعطای جایزه به برندگان مسابقه: بەخشینی خەلات بە سەرکەوتوانی کێبەرکێ›.

▣ **اعطای جوایز**: دانی خەلات؛ خەلات دان.

▣ **اعطا کردن**: بەخشین؛ پێدان؛ بەشین؛ بەخشەی؛ پنەدەی. هەروەها: **اعطا شدن**

**اعطائی** / e'tā'î/: [عربی] ☜ **اعطایی**

**اعطایی** / e'tāyî/: [عربی] *صفت*. بەخشراوە؛ خەلاتکراو؛ دراو ‹کتاب اعطایی: کتێبی بەخشراوە›.

**اعظم** / a'zam/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* ۱. مەزنترین؛ گەورەترین؛ بەرزترین؛ گەورەتر لە هەموو ‹مسجد اعظم: گەورەترین مزگەوت› ۲. گەورەتر؛ بالاتر ‹سلطان اعظم: سولتانی هەرەگەورە›.

**اعقاب** / a'qāb/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* تۆرەمە؛ رەگەز؛ نەتەوە؛ زار و زێچ؛ رەچەلەک؛ وەچەوبەرە؛ نەوە ‹مردم سیستان خود را از اعقاب رستم می‌دانند: خەلکی سیستان خۆیان لە تۆرەمەی رۆسەم دەزانن›.

**اعلا** / a'lā/: [عربی] *صفت*. ۱. هەلبژاردە؛ تەلبژێر؛ تەلچن؛ هێژا؛ بالا؛ بەرز؛ مەزن؛ مازن ‹مقام اعلا: مەقامی مەزن› ۲. زۆرچاک؛ خاوەن چۆنیەتی زۆر چاک ‹چای اعلا: چای زور چاک›.

**اعلاحضرت** / a'lāhazrat/: [عربی] *اسم*. سەرۆک؛ پایەبەرز؛ بالا مەقام: **اعلیحضرت**

**اعلاحضرتین** / a'lāhazrateyn/: [عربی] *اسم*. هەر دوو سەرۆک: *(الف)* دوو پاشا *ب)* شا و شابانوو؛ شا و ژنەکەی ✻ **اعلیحضرتین**

**اعلام** / a'lām/: [عربی] *اسم*. ناوی تایبەتی (وەکوو کرماشان، فیردەوسی، نیاگارا، ماد).

**اعلام** / e'lām/: [عربی] *اسم*. راگەهێنی؛ ئاگاداری؛ تێگەیاندنی خەلک بۆ فەرمان و کارێ.

▣ **اعلام جرم**: راگەیاندنی تاوان؛ تاوانبار کردنی کەسێک بە قەومانی تاوانێک لە لایەن ئەوەوە، دوای لێکۆلینەوەی لەلایەن دادگاوە.

**اعلام خطر**: راگەیاندنی مەترسی.

**اعلام رای**: راگەیاندنی را؛ راگەیاندنی بروا.

**اعلام مواضع**: *[سیاست]* دەربرینی بۆچوون؛ هەلوێست راگەیاندن.

**اعلام موجودیت**: *[سیاست]* راگەیاندنی هەبوون؛ ئاگەداری دان لە بارەی پێکهاتنی بنکەیەکی رامیاری، لە لایەن گوتەبێژیەوە.

▣ **اعلام شدن**: راگەیێندران؛ ئالان؛ داردایەن؛ راگەیاندن بەتایبەت لە لایەن ناوەندێکی رەسمیەوە ‹امروز نام برندگان اعلام شد: ئیمرۆ ناوی سەرکەوتووەکان راگەیێندرا›. هەروەها: **اعلام کردن؛ اعلام داشتن**

**اعلامیه** / e'lāmîyye، ـها/: [عربی] *اسم*.

ئاگادارنامە؛ ئاگاداریننامـە؛ داخویـان؛ بـە لاڤـۆک؛ نووسراوە یەک بۆ ڕاگە یانـدنی شـتێ (زۆرتـر) بـە شێوەی هەواڵ.

**اعـلان** / e'lān'، ـهـا؛ ـات/: [عربـی] /اسـم. *[قـدیمی]* ۱. عـام فـام؛ جـاڕ؛ جـاڕدەی؛ ڕاگـەیانـدنی خەبەر بە ناو خەڵکدا ۲. ☜ **اعلامیّه**

▣ **اعـلان جنـگ:** ڕاگـەیانـدنی شـەڕ؛ ئاگـاداری دانی وڵاتێک بە وڵاتێکـی تـر کـەوا لـە گـەڵـی بە شەڕ دێ.

**اعلـم** / a'lam'/: [عربـی] صـفت. *[ادبـی]* زانیـار؛ زانستمەند؛ زۆر زانا.

**اعلی** / a'lā'/: [عربی] ☜ **اعلا**

**اعلیحـــــضرت** / a'lāhazrat'/: [عربـــــی] ☜ **اعلاحضرت**

**اعلیحـــضرتین** /a'lāhazrateyn'/: [عربـی] ☜ **اعلاحضرتین**

**اعـــم** / a'am(m)'/: [عربـی] صـفت. گـشتی؛ هـەمـووانی؛ گـردی ‹بـە طـور اعـم: بـە شـێوەی هەموانی›.

**اعمـاق** / a'māq'/: [عربـی] /اسـم. ۱. جمـعِ ☜ **عُمـق** ۲. قـووڵایی؛ قـووڵانی؛ قووڵـی؛ نـاخ؛ کـوور؛ کـوور ‹از اعمـاق وجـود: لـە قـووڵایی دڵەوە›.

▣ **اعمـاق دریـا:** قـووڵایی دەریـا؛ بـن/ بنکـی زەریا.

**اعمـال** / a'māl'/: [عربـی] /اسـم. ۱. جمـعِ ☜ **عَمَل** ۲. کـردە؛ کـردار؛ کریـار؛ ئاکـار؛ کـەردەوە؛ ڕەوشـت؛ ڕەفـت؛ کـرن ‹اعمـال ناشایـست: کرداری نالەبار›.

▣ **اعمـال شـاقه:** کارگـەلی دژوار؛ کارگـەلی سەخت؛ کارێن گران.

**اعمـال** / e'māl'/: [عربـی] /اسـم. دەکـارهێنی؛ بەکاربەری؛ بـەکارگـری؛ کـار یـان ڕەوتی شـتێ هێنانە بەرکارەوە.

▣ **اعمـــال زور:** زۆرە ملــــێ؛ زۆرداری؛ کەلەگـایی؛ کـار یـان ڕەوتی بـەکـار هێنـانی زۆر.

**اعمـال نفـوذ:** دەستێبـەری؛ ڕەوتی دەس تێـوەردان؛ دەس تێخـستن؛ مایـێ خـۆ تێکرن.

▣ **اعمـال‌شـدن:** دەکـار چـوون؛ دەکـارکران؛ بەکار هاتن؛ بکار خستن.

**اعمال کردن:** بە کارگرتن.

**اعمـــام** / a'mām'/: [عربـی] جمـعِ ☜ **عَـم**، **عَمو**

**اعـــوان** / a'vān'/: [عربــی] /اسـم. *[ادبــی]* دەسـیاران؛ ئاریکـاران؛ دار و دەسـتان؛ دەسـت و پێوەندان.

**اعـوان‌وانـصار** / a'vān-o-ansār'/: [عربـی] اسم. *[ادبی]* دەسیاران و ئاریکاران.

**اعوجـاج** / e'vecāc'، ـهـا؛ ـات/: [عربـی] /اسم. *[ادبی]* خـواری؛ خـاری؛ لاری؛ گێڕی؛کـەچایی؛ خوار و خێچی؛ لار و لەوێری؛ لار و گێڕی.

**اعوذبـالله** / a'ûzobellāh'/: [عربـی] *دعـا.* پـەنـا بە خـدا؛ پـەنـا بـۆ خـوا (لـە کـاتی پـەشـیمانی و حاشادا دەگوترێ).

**اعیاد** / a'yād'/: [عربی] جمعِ ☜ **عِیْد**

**اعیـان** / a'yān'/: [عربـی] /اسـم. دەوڵـەمـەنـد؛ بـوودە؛ بـوود؛ خـاوەن مـاڵ؛ دەسمایـەدار: ۱. /ـها/ کەسێ کـە دەوڵـەمـەنـد و خـاوەن ژیـانی خۆشە ۲. /ـها/ کـەسێ کـە بـە هـۆی توانـای مالـیـەوە ڕێـزی لـێ ئـەگیرێـت ۳. *[قـدیمی]* ئەزمووندارن؛ گـەورەگـەل؛ مـەزنـان ٤. *[فلسفه]* شت؛ هـەرچـی ٥. *[حقـوق]* مـاڵ؛ هـەرچـی لـە بەرچاوە و نرخێکی هەیە.

**اعیـانی**[1] / a'yānî'/: [عربـی] /اسـم. مـلک و مـاڵ؛ خانوو و دامەزراوەگەلێـک کـە لـە گـۆڕەپانێکـدا دروست‌کراون.

**اعیانی**[2]: صفت. دەوڵـەمـەنـدی؛ بـوودە یـی: ۱. سـەبـارەت/ بـەسـتراو بـە دەوڵـەمـەندیـەوە ۲.

خاوەن شکۆ و پایەبەرزی ‹زندگی اعیانی: ژیانی دەوڵەمەندی›.

**اعیانیت** / a'yānîyyat'، ـها/: [عربی]/اسم. دەوڵەمەندی؛ خاوەن ماڵی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی خاوەن ماڵ و سامان بوون.

**اغتشاش** / eqtešāš'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. بشێوە؛ تێکەڵ‌پێکەڵی؛ شڵەژاوی؛ شێواوی؛ بەیەکا دراوی ‹اغتشاش در دانشگاه: بشێوە لە زانستگا›.

**اغتنام** / eqtenām'/: [عربی]/اسم. [ادبی] دەلیڤە؛ ڕەوتی بە هەڵکەوت/ دەسکەوت زانین.

▣ **اغتنام فرصت**: هەل بە دەرفەت زانین.

**اغذیه** / aqziye'/: [عربی] جمعِ ☜ **غَذا**

**اغذیەفروشی** / aqziefurûšî'، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. چێشتخانە؛ خارنگەهـ؛ خواردەمەنی فرۆشی. هەروەها: **اغذیەفروش**

**اغر** / oqor'/: [ترکی]/اسم. ۱. ودم؛ هورم؛ ممبارە کی؛ پیرۆزی؛ فەڕ ‹خوش اغر: بە ودم› ۲. ئۆغر؛ ئۆخر؛ بەرەکەت ‹اغر بە خیر: ئوغر بە خێر› ✻ **اُوغُور**

**اغراض** / aqrāz'/: [عربی] جمعِ ☜ **غَرَض**

**اغراق** / eqrāq'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. زیادەبێژی؛ زێدەڕۆیی: ۱. زیادەوێژی لە وتنی کارێکدا ‹شما دربارەی کارهای دولت اغراق می‌کنید: ئێوە لە بارەی کارەکانی دەوڵەتەوە زیادەبێژی دەکەن› ۲. قسەیەک کە زیادە بێژیە ‹دربارە سرمای زمستان اغراق می‌کرد: لە مەڕ سەرمای زستانەوە زیادەبێژی دەکرد› ۳. [ادبی] زیادەڕەوی شێعری.

**اغراق‌آمیز** / eqrāqāmîz'/: [عربی/ فارسی] صفت. زۆرپێوەنراو؛ فڕ و فیشاڵی ‹مقالەی اغراق‌آمیز: وتاری زوریێوەنراو›.

**اغراق‌گویی** / eqrāqgûyî'، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. زیادەبێژی؛ فڕو فیشاڵ بێژی ‹بە اغراق‌گویی‌هایش عادت کردەایم: بە زیادەبیژیەکانی ڕاهاتووین›. هەروەها: **اغراق کردن**

**اغفال** / eqfāl'/: [عربی]/اسم. فریوکاری؛ دەسخەڕۆینکەری؛ کار یان ڕەوتی خاپاندن و هەڵخەڵەتاندنی کەسێک بە مەبەستی کەڵک لێ وەرگرتن ‹شاکی می‌گوید بە وسیلەی متهم اغفال شدە است: گازندەکار دەڵێ تاوانبارکراو خلەتاندوویە›.

▣ **اغفال شدن**: فریو خواردن؛ هەڵخەڵەتان؛ خاپێنران؛ هەڵفریوان؛ خەڵەتێنران؛ سەرداچوون.

**اغفال کردن**: فریو دان؛ هەڵخەڵەتاندن؛ خاپاندن؛ هەڵفریواندن؛ خەڵەتاندن؛ سەردا برن؛ خەڵەتنەی.

**اغفالگر** / eqfālgar'، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. فریودەر؛ هەڵخەڵەتێن؛ خاپێنەر؛ سەردابەر. هەروەها: **اغفالگری**

**اغلاط** / aqlāt'/: [عربی] جمعِ ☜ **غَلَط**

**اغلب** / aqlab'/: [عربی] قید. زۆربە؛ زۆرجاران؛ زۆرتری؛ پڕایی؛ زۆرینە؛ فرەتر؛ فرەو؛ زۆرتر؛ زۆریا؛ پتریا ‹اغلب گردوها پوک بودند: زوربەی گوێزەکان پووچەڵ بوون›.

▣ **اغلب اوقات**: زۆرجاران؛ فرەوەخت؛ فرەکات؛ پڕانیا جاران؛ پتریا وەختان.

**اغلوطه** / oqlûte'/: [عربی]/اسم. [ادبی] ۱. وتەیەک کە دیتران پێی بکەونە هەڵەوە ۲. پڕ و پووچ؛ فلتە و هۆڕ؛ وتەی پووچ ۳. نەتەبایی؛ نەڕێکی؛ نارێکایەتی؛ بریتیە لە بوونی دوو واتای دژ بە یەک بۆ تاقە مەبەستێک، کە نە دەکرێ پێکەوە ببن و نەش دەکرێ لاچن، واتا تاقە شتێک کە نە بتوانێ مەکۆی ئەو دوو واتا جیاوازە بێ و نەش بتوانێ لە هەردووکیان بێوەری بێ (وەک بوون و نەبوون؛ ڕووناکی و تاریکی؛

بەدەنگی و بێدەنگی و...).

**اغمـا** / eqmā'/: [عربـی]/اسـم. لـەپـژ؛ بێهۆشـی؛ بوورانەوە؛ شۆبە؛ بووردنەوە.

⊡ **بـه حالـت اغمـا افتـادن:** لـه هـۆش چـوون؛ دڵبوردنەوە؛ چویْشـیەی؛ ویـەردەیـوە؛ ژخـۆ چوون؛ نەهەش بوون.

**اغمـاض** / eqmāz'/: [عربـی]/اسـم. چاوپۆشـی؛ کـار یـان ڕەوتی بـوردن؛ نـەدیـتن؛ چاوپۆشـی کـردن لـە هـەڵـە یـان تـاوانی کـەسـێک.

هەروەها: **اغماض کردن**

**اغنـام** / aqnām'/: [عربـی]/اسـم. کـەواڵ؛ مـاڵات؛ مەڕ و بزن؛ شەگەلە؛ بزە و مەی؛ وەرەگەل.

**اغنیـا** / aqniyā'/: [عربـی]/اسـم. دەوڵـەمـەنـدان؛ خـاوەن ماڵـیـەل ‹اغنیـا در غـم فقـرا نیـستند: دەولەمەندان خەمی هەژاران ناخۆن›.

**اغوا**/ eqvā'، ـها/:[عربی]/اسم. هەڵخەڵـەتێنی؛ کـار یـان ڕەوتی فریـودان و بـردن بـە لای کـاری بـە خـەسـاردا ‹بـر اثـر اغـوای تـو خانـه را فـروختم: بـە هـۆی هەڵخەڵـەتێنی تـۆوە ماڵـەکـەم فرۆشت›. هەروەها: **اغوا شدن؛ اغوا کردن**

**اغـواگر** / eqvāgar'، ـها؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت.* هەڵخەڵـەتێن؛ خـەڵـەتێنـەر؛ خاپێنـەر؛ فریودەر؛ سەردابەر. هەروەها: **اغواگری**

**اغواگرانـه** / eqvāgarāne'/: [عربـی/ فارسـی] *قید.* فریوکارانە؛ خاپێنـەرانـە؛ سـەردابـەرانـە؛ بـە شێوازی فریودان.

**اغیـار** / aqyār'/: [عربـی]/اسـم. *[ادبـی]* ۱. *[نامتـداول]* دیتـران؛ ئیتـران؛ کـەسـانی‌تـر؛ یۆتـەرێ؛ ئـەوانی‌تـر ۲. بیانیگـەل؛ لاوەکیـان؛ بێگانـێ ۳. *[عرفـانی]* جگـە لـە یـار؛ هـەر کەسێکی‌تر بێجگە دڵبەر.

**اف** / of'/ ☜ آخ

**افادات** / efādāt'/: [عربی] جمعِ ☜ **افاده**

**افـاده** / efāde'/: [عربـی]/اسـم. *[گفتـاری]* ۱. خۆهـەڵکێـشی؛ خۆپـەسـێنی؛ قاپـانی؛ دەمـارزلی؛ لووتبـەرزی؛ خۆبـەزلزانی؛ دەعیـە؛ فیز؛ کەش و فش؛ چـس ـفـس؛ کـەشوقنگ؛ کەباردە؛ ئاکاری فیزانە ‹نمی‌دانم این همه افاده برای چیست؟: نازانم ئـەم گـشتە خـۆ بـە زل زانیـە بۆ چیە؟› ۲. *[افادات/[ادبی]* قازانجدەر؛ کـار یـان ڕەوتی وەچ و بەرە گەیاندن؛ مفاگەهاندن.

⊡ **افـاده داشـتن:** بـە ئیفـادە بـوون؛ بـە فیـز بوون؛ دەماربەرز بوون.

**افـاده فـروختن:** فیزکـردن؛ دەعیـە و دەمـار فرۆتن؛ وێ گێرتەی؛ ب خۆ نازین.

**افـاده کـردن:** قـازانجگـەیانـدن؛ سـوود گەیاندن؛ بەهرەدار بوون.

**افادەی مقصود کردن:** مەبەست دەربڕین.

**افـادەای** / efāde'ī، ـهـا/: [عربـی] *صـفت. [گفتـاری]* خـۆبین؛ خۆپـەسـەنـد؛ تـرزڵ؛ خـۆڕازی؛ دفـنبلنـد ‹کـسی از آدم افـادەای خوشـش نمی‌آیـد: کـەس لـە مـرۆی خویـەسـند خۆشی نایەت›.

**افاضـات** / efāzāt'/: [عربـی]/اسـم. ۱. جمـعِ ☜ **افاضـه** ۲. فـەرمایـشات ‹از افاضـات اسـتاد بهـرەمنـد شـدیم: لـە فـەرمایـشاتی مامۆسـتا کەڵکمان وەرگرت›.

**افاضـه** / efāze'، ـهـا؛ افاضـات/: [عربـی]/اسـم. *[ادبـی]* کـاری بـەهـرە پێگـەیانـدن لـە ڕێگـای وتارەوە.

**افاعیـل** / afā'īl'/: [عربی]/اسم. کێـشی شـێعر، کـە لـە پیتگـەلی «ا»، «ت»، «س»، «ن»، «م»، «و»، «ب» لـەگـەڵ سـێ پـیتی «ف» و «ع» و «ل» (فـانوس تعلـیم) پێکـدێ (وەک فعوولن، فاعلن، مفتعلن، مستفعلن).

**افاغنـه** / afāqene'/: [از عربـی] جمـعِ ☜ **افغانی**[1]

**افـاف** / ef'ef'، ـها/: [؟]/اسم. ئێـف ـ ئێـف؛ ناوی بازرگانی؛ دەرگا کەرەوەی کارەبایی.

**افاقـه** / efāqe'/: [عربـی]/اسم. ۱. ڕۆشـنایەتی؛

فه رحانی؛ باشتری ‹پسرم برود سر کار افاقه‌ای حاصل می‌شود: کوڕەکەم بڕواتە سەر کار فەرحانیەکمان تێدەکەوێ› ۲. کەڵک؛ قازانج؛ وەچ؛ سوود؛ بەهرە؛ مفا ‹معالجه و درمان افاقه نکرد: دەوا و دەرمان کەڵکی نەبوو›.

▣ **افاقه بخشیدن:** بەرهەم هێنان؛ بەهرە دان؛ بەکەڵک بوون.

**افاقه کردن:** کەڵک‌گرتن؛ بە قازانج بوون.

**افت** / oft' ـها/: /اسم. ۱. کەوت؛ کەفت؛ کار یان ڕەوتی کەوتن ‹افت و خیز: هەڵس و کەوت› ۲. ئەفرۆز؛ کار یان ڕەوتی دابەزین؛ هاتنە خوارەوە ‹افت محصول: دابەزینی داهات› ۳. داکەوت؛ کێمایی؛ کەم بوونەوە؛ هاتنە خار ‹افت کیفیت: داکەوتی چۆنیەت/ چۆناوچۆنی›.

▣ **افت تحصیلی:** سەر نەکەوتن لە خوێندندا.

▣ **افت داشتن:** ۱. هاتنە خوارەوە؛ کەم کردن؛ کێمی دان ‹امسال قیمتها کمی افت دارد: ئەوساڵ نرخەکان تۆزێ هاتوونەتە خوارەوە› ۲. داشکان؛ کەم بوونەوە؛ کەمەو بوون ۳. کاشک لێهاتن؛ شوورەیی بوون؛ عەیب و عار بوون؛ هۆی کەم بوونەوەی ئابڕوو.

**افت کردن:** ۱. دابەزین؛ کەمەو بوون ‹قیمتها کمی افت کرده اند: نرخەکان تۆزێ دابەزیون› ۲. دواکەوتن؛ لە هاومالان بەجێمان.

**افتادگی** / oftādegî'/: /اسم. ۱. /ادبی/ خاکەساری؛ داکەوتوویی ‹افتادگی آموز اگر طالب فیضی: خاکەساری فێر بە ئەر بیرت لەلای سەرکەوتنە› ۲. /ـها/ کەمایەسی؛ ناتەواوی؛ کەموکووڕی ‹این کتاب چند صفحه افتادگی دارد: ئەم کتێبە چەند لاپەڕە ناتەواوی هەیە› ۳. /پزشکی/ کەفتن؛ کەوتن؛ داکەوتن؛ داهێزان؛ کەوتەیرە؛ داکەوتنی ئەندامێک لە جێگای سروشتی خۆی ‹افتادگی شکم: داکەوتنی ناوک›.

**افتادن** / oftādan'/: مصدر. لازم. متعدی. //**افتادی**: کەوتی؛ **می‌افتی**: دەکەوی؛ **بیفت**: بکەوە// ◻لازم. کەوتن؛ کەفتن؛ کەوتش؛ کەتن؛ کەوتەی: ۱. داکەوتن؛ کەوتەیرە؛ ئەرەکەوتەی؛ بەربوونەوە بە زەویدا ‹از درخت افتادن: لە دار داکەوتن› ۲. کەوتنە نێو چالایی یان شتێکەوە؛ کەوتەیرە ‹در آب افتادن: کەوتنە ناو ئاو› ۳. داریانەوە؛ داریایوە؛ ئەوەداریەی؛ کەوتن بە هۆی لە دەسدانی هاوسەنگی ‹افتادن درخت: کەوتنی دار› ٤. هەبوون لە حاڵەتێکدا ‹گیر افتادن: گیر کەوتن› ٥. لە دەستدانی شتێک ‹از نفس افتادن: لە هەناسە کەوتن› ٦. بڵاو بوونەوە بە سەر شتێکدا ‹آفتاب افتاد: خۆر کەوت› ۷. شۆپ و نیشانەی شتێک پەیدا بوون ‹لکه افتادن: لەکە کەوتن› ۸. لە شوێنێ بەرهەڵدا بوون ‹گوشەی اتاق افتاده بود: لە سووچی ژوورەکە کەوتبوو› ۹. دان؛ کەوتەینە؛ لە هەمبەر شتێکەوە بوون ‹آتش افتاده بود به انبار: ئاور کەوتبووە ناو هومارەکەوە› ۱۰. کەوتەیرە؛ زەوینگیر بوون یان پەک‌کەوتن ‹یک سال توی خانه افتاده بودم: یەک ساڵ کەوتبوومە نێو جێگاوە› ۱۱. کۆتایی هاتنی کار یان ڕەوتێک ‹از سر و صدا افتادن: لە هەرا و هوریا کەوتن› ۱۲. لە پڕ ڕوودانی شتێ ‹به یاد چیزی افتادن: بیر شتێ کەوتن› ۱۳. کەوتنە سەر ڕێگایەک ‹خانەشان افتاده است وسط خیابان: ماڵەکەیان کەوتووەتە نێوەڕاستی شەقامەوە› ١٤. گرۆ بوون بە کار یان ئاکارێک و بە دوویا چوون ‹به شراب خوری افتادن: کەوتنە شەراو خواردن› ١٥. جێ‌کەن بوون ‹دو تا دندانش افتاد: دوو ددانی کەوت›

۱۶. [مجازی] نەبوونی توان بۆ درێژەدان بە کار ‹از خستگی داشت می‌افتاد: خەریک بوو لە شەکەتیدا بکەوێ› ۱۷. لە بار چوون ‹بچەی چهار ماهەاش افتاد: سکی چوار مانگەی کەوت› ۱۸. کەفتنە یەک؛ کەوتەی ورێو؛ ڕوودانی دوو ڕووداو پێکەوە ‹ماه رمضان بە تابستان افتاده بود: مانگی ڕەمەزان کەوتبووە هاوین› ۱۹. چوون بۆ لای کەس یان شوێنێک ‹حالا کە کارم به تو افتاده، ناز می کنی: ئێستا کە کارم کەوتۆتە لای تۆ، خۆتم بۆ ئەگری› ۲۰. تیشکدان؛ تاویەی؛ دای ‹نور خورشید افتاد توی چشمم: تیشکی خۆر کەوتە نێو چاوانم› ۲۱. ڕەش بوون یان لە بایەخ کەوتن ‹از چشم مردم افتادن: لە بەر چاو خەڵک کەوتن› ۲۲. [گفتاری] میوان بوون ‹فردا شب خانەی عمە افتادەایم: سبەی شەو لە ماڵ پوورم کەوتوین› ۲۳. بلاو بوونەوە ‹چو افتادن: قوو داکەوتن› ۲۴. نیشتن؛ بارین؛ وارەی ‹دیشب برف سنگینی افتاد: دوێنێ شەو بەفرێکی قورس نیشت› ۲۵. لە ئەزموونـدا سەرنەکەوتن ‹از درس فارسی افتادن: کەوتن لە دەرسی فارسیدا› □ متعدی. ۲۶. شوێن‌کەوتن ‹بە دنبال کسی افتادن: کەوتنە شوێن کەسێ› ۲۷. دانە بەر پەلامار؛ ئەنەکەوتەی ‹بە جان کسی افتادن: کەوتنە گیان کەسێ›. هەروەها: **افتادنی**

■ صفت مفعولی: **افتاده** (کەوتوو) / مصدر منفی: **نیفتادن** (نەکەوتن)

**افتاده** / oftāde'، ـها؛ ـگان/: صفت. ۱. خاکەسار؛ بێ دەمار؛ خۆشکێن؛ بێ‌فیز؛ خۆ بە زل نەزان ‹مرد افتادەای است: پیاوێکی خاکەسارە› ۲. [ادبی] هەژار؛ بێ‌ئەنوا ۳. کەتی؛ کەوتوو؛ خانەنشین؛ گردەنشین؛ کەسێ کە لەبەر پیری یان نەخۆشی نەتوانێ لە ماڵ دەرکەوێ.

**افتادەحال** / oftādehāl'، ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. [ادبی] ۱. خاکەسار؛ خۆشکێن؛ بێ‌فیز ۲. هێدی؛ هێور؛ بێ‌دەنگ؛ پشوو لە سەرخۆ؛ خۆشکاندی.

**افتان‌وخیزان** / oftān-o-xîzān'/: قید. پەت و کۆ؛ هۆرس و کەوت؛ لە حاڵی کەوتن و هەستانەوەدا، لە بەر بێ‌هێزی.

**افتتاح** / eftetāh'/: [عربی] اسم. کار یان ڕەوتی کردنەوە؛ کرانەوە: ۱. کار یان ڕەوتی دەسپێکردنی ڕێوڕەسمێک (وەکوو جێژن، کێبەرکێ) ۲. کردنەوەی ڕێکخراوەیەک ‹افتتاح بیمارستان پاوە: کرانەوەی نەخۆشخانەی پاوە› ۳. دەسپێکی بەهرەگری لە ئامرازێک؛ ڕێخستن ‹افتتاح بزرگراه زنجان ـ قزوین: کرانەوەی شارێی زەنجان ـ قەزوین› * **گشایش**

▣ **افتتاح حساب**: کار و ڕەوتی حەساو باز کردن؛ حەساوکردنەوە؛ کردنەوەی حیساب لە لای دامەزراوەیەکی ماڵی بەتایبەت بانکەوە.

▣ **افتتاح شدن**: کرانەوە؛ کریایوە؛ ڤەکرن.

**افتتاح کردن**: کردنەوە؛ بازکردن؛ کردەیوە.

**افتتاحیه** / eftetāhîyye'/: [عربی] صفت. دەسپێکانە؛ دەرگوشاد؛ سەبارەت بە خستنەڕێ ‹نطق افتتاحیه: وتاری دەسپێکانە›.

**افتخار** / eftexār'/: [عربی] اسم. هەمیازی؛ شانازی؛ بەختەوەری؛ ئیفتیخار: ۱. حاڵەتی شادی و ڕازی بوونی زۆر ‹کردستان بە فرزندانش افتخار می‌کند: کوردستان بە ڕۆڵەکانیەوە شانازی دەکات› ۲. /ـها؛ ـات/ [گفتاری] هۆی شانازی؛ هۆی بەختەوەری؛ هۆی سەربەرزی؛ کەس یان شتێک کە ئەبێتە هۆی شانازی پێ کردن؛ جێ شانازی بوون ‹شجاعت تو موجب افتخار من است: ئازایەتی تۆ، هۆی شانازی منە›.

▣ **به افتخار**: بۆ سەربڵێندی؛ بۆ سەربەرزی

‹به افتخار برنده‌ی مسابقه کف زدند: بۆ سەربەرزی بەرەندەی کێبەرکێکە چەپڵەیان لێدا›.

⊡ **افتخار داشتن:** سەربەرز بوون؛ سەربڵیند بوون.

**افتخار کردن:** شانازی کردن؛ نازین.

**افتخارآفرین** / 'eftexārāfarîn'، ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* شانازی‌هێنەر؛ سەربەرزی‌هێنەر ‹پیروزی افتخارافرین: سەرکەوتنی شانازی‌هێنەر›.

**افتخاری** / 'eftexārî'/: [عربی] *صفت.* ۱. خاوەن پلەیەک بێ ئەنجامدانی کار یان تێپەڕکردنی بواری پێویست ۲. بێ‌مز؛ فەخری؛ بەشانازی.

**افترا** / 'efterā'/: [عربی]/*اسم.* دەلەسە؛ چەفتە؛ درۆهەڵبەست؛ دەس‌هەڵبەس؛ خۆهەڵبەست؛ تۆمەت؛ بێبەختی: ۱. بوختان؛ کار یان ڕەوتی درۆ هەڵبەستن بۆ کەسێک و کارێکی ناڕەوا دانە پاڵی ‹مخالفان به افترا متوسل شده‌اند: نەیاران کەوتوونەتە درو هەڵبەستن› ۲. /ـها؛ ـات/ بوختیان؛ وتەیەکی درۆینە کە لە بارەی کەسێکەوە دەگوترێت ‹این حرفها افتراست: ئەم قسانە دەلەسەن›.

هەروەها: **افترا زدن؛ افترا گرفتن**

**افتراآمیز** / 'efterā.āmîz'/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بوختاناوی؛ بوختیانی؛ ئاوێتە لەگەڵ بوختیان؛ هەڵبەستەی ناڕەوا؛ بە بوختیانەوە ‹مقاله‌ی افتراآمیز: وتاری بوختیانی›.

**افتراق** / 'efterāq'/: [عربی]/*اسم.* ۱. جیاکاری؛ دووبەرەکی ۲. /ـها؛ ـات/*[نامتداول]* جیایی؛ جیاوازی؛ ناکۆکی؛ جوداهی؛ ناتەبایی.

**افتراقی** / 'efterāqî'/: [عربی] *صفت.* جیاوازانە؛ پێوەندیدار بە جیاکاریەوە.

**افتضاح**[1] / 'eftezāh'، ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم.* شەرمەساری؛ ڕووسیایی؛ ئابڕوونەماوی؛ ناوزڕاوی؛ شڕتۆپ؛ هەتکبەری.

⊡ **افتضاح بار آوردن:** گەنەکاری کردن؛ پەن دان؛ کەتن ژەنەی: **افتضاح کردن**

**افتضاح کردن** ☜ **افتضاح بارآوردن**

**افتضاح**[2]: *صفت.[گفتاری]* ناحەز؛ نالەبار؛ فەهێت؛ هەرمی؛ شڕتۆپ؛ فرە ناوەش؛ زۆر خراپ ‹خطش افتضاح بود: نووسینی ناحەز بوو›.

⊡ **افتضاح بودن:** زۆر خراپ بوون.

**افتضاح شدن:** زۆر خراپ پێ‌هاتن؛ هەتک چوون؛ زۆر ناحەز بوون.

**افت‌وخیز** / 'oft-o-xîz'، ـها/: *اسم.[ادبی، مجازی]* هەڵس‌وکەوت؛ هۆرز و نیشت: ۱. کەند و لەند؛ خاس و خراپ بوون لە ڕەوتێکدا، بەتایبەت لە ژیاندا ‹زندگی افت‌وخیز بسیار دارد: ژیان هەڵس‌وکەوتی زۆرە› ۲. هەڵس و بنیش؛ هەڵسان و دانیشتن ‹مدتی که با او افت‌وخیز داشته باشی، اخلاقش دستت می‌آید: ماوەیەک لە گەڵیا هەڵس‌وکەوتت ببێ، شارەزای خۆوخدەی ئەبی›.

**افتیمون** / 'aftîmûn'، ـها/: [معرب از یونانی] *اسم.* مێوەخۆرکە؛ سەڕاجە؛ سوەیل؛ عالف پێچ؛ بنەگیایێکی یەکسالانی گوڵ سپی و زەردە بۆ دەرمان دەبێ: **کَشوت**

**افچه** / 'afče'، ـها/:*اسم.* داهۆڵ؛ داهۆڵ؛ داوەڵ؛ داوڵ؛ هۆراسە؛ هەلامەت؛ مەتەرس؛ بنیادەمۆکەی ناو مەزرا، بۆ ترساندنی پەلەوەر.

⊡ **افچه ی بارانی:** بووکە بارانە؛ وەولە بارانی؛ وەیولە/ هۆلێ وارانێ؛ وەویلە بارانی؛ کۆتەلێکی لە چێو و پەڕۆ کە مندالان بە مالاندا دەیگێڕن و ئاوی بەسەردا دەکەن.

**افرا** / 'afrā'، ـها؛ ـیان/:*اسم.* ئافرا؛ هەفرەس؛ هەفرست؛ هێفرست؛ دارێکی کێوی

گەلادەرزیە.

**افراختن** / afrāxtan'/ ☜ **آفراشتن**

**افراخته** / afrāxte'/ ☜ **آفراشته**

**افراد** / afrād'/: [عربی] جمعِ ☜ **فَرد**

▣ **افراد خانواده:** خێزان؛ ماڵ و منداڵ؛ خا و خێزان؛ خێزانی ماڵ؛ کەس ماڵ؛ نانخۆری ماڵ.

**افراز** / efrāz'/: [عربی]/*اسم. [حقوق]* بەشەوکردن؛ بەش کردن؛ بەش کردنی ملک و ماڵ و دانانی بەشی هاوبەشان.

**افراشتن** / afrāštan'/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**افراشتی:** هەڵتدا؛ **می‌افرازی:** هەڵدەدەی؛ **بیفراز:** هەڵدە // هەڵدان؛ هۆردەی؛ هۆردای: ١. بەرزەوە کردن؛ هەل گاڤتن؛ هەڵبڕاندن ‹افراشتن پرچم: هەڵدانی ئاڵا› ٢. دامەزراندن؛ ئەرەمەرزنەی ‹خیمە افراشتن: هەڵدانی ڕەشماڵ› ✻ **افراختن**. هەروەها: **افراشتنی**

■ صفت فاعلی: **افرازنده** (هەڵدەر)/ صفت مفعولی: **افراشته** (هەڵدراو)/ مصدر منفی: **نَیَفراشتن** (هەڵنەدان)

**افراشته** / afrāšte'/: *صفت.* ١. هەڵدراو؛ ڕاستەوکراو؛ هەڵبڕاو؛ هۆردریا ٢. ڕاوەستاو؛ دامەزراو؛ هەڵدای: **افراخته**

**افراط** / efrāt'، ـها/: [عربی]/*اسم.* تەلاس؛ زێدەگاڤی؛ سەرچڵی. هەروەها: **افراط شدن؛ افراط کردن**

**افراط‌وتفریط** / efrāt-o-tafrît'، ـها/: [عربی] *اسم.* خەمساری و زێدە گاڤی؛ دووباری دژ بە یەک و دوور لە ناوندیەتی (وەک ڕژدی و دەسبایی).

**افراطی** / efrātî'، ـها؛ ـان؛ ـون/: [عربی] *صفت.* تەلاسی؛ سەرچڵی: ١. توند و تیژ یان کولەکولکەر ٢. *[سیاست]* زێدەڕۆ؛ وندڕەو؛ خورت.

**افروختگی** / afrûxtegî'/: *اسم.* هەڵگرساوی؛ دایساوی؛ هەڵگرسیاگی؛ پێکراوی ‹افروختگی آتش: هەڵگرساوی ئاگر›.

**افروختن** / afrûxtan'/: *مصدر. لازم. متعدی. [ادبی]*// **افروختی:** هەڵتگیرساند؛ **می‌افروزی:** هەڵدەگیرسێنی؛ **بیفروز:** هەڵگیسێنە// ☐*لازم.* ١. داگرسان؛ هەڵبوون؛ ئەنەگیسیەی؛ گیسیاینە؛ پێبوونی ئاگر؛ گڕ تێبەربوون؛ داگرسیان؛ ئایسان؛ گڕ لێ پەیدا بوون ٢. گەشیانەوە؛ گەشیایوە؛ گەش بوونەوە؛ سوورەو بوون ☐ *متعدی.* ٣. داگرساندن؛ هەڵکردن؛ دایساندن؛ هەڵگرساندن؛ ئایساندن؛ نێڵدان؛ پێکردنی ئاگر؛ داگیرساندن؛ داییساندن؛ هەڵگڕاندن؛ گیسناینە؛ ئەنەگیسنەی؛ ئەیرەوەکەردەی؛ گڕنەی. هەروەها: **افروختنی**

■ صفت فاعلی: **افروزنده** (ـ) / صفت مفعولی: **افروخته** (داگرساو) / مصدر منفی: **نَیَفروختن** (دانەگرسان)

**افروخته** / afrûxte'/: *صفت. [ادبی]* هەڵکراو: ١. داگرساو؛ هەڵگرسیاگ؛ ڕۆشن ‹چراغ افروخته: چرای هەڵکراو› ٢. هەڵگڕاو؛ هەڵکردی؛ داگرسیاگ، پێکراو؛ بەتین؛ وێ ‹آتش افروخته: ئاگری هەڵکراو›.

**ـ افروز** / afrûz'/: *پیوازه.* ـ هەلایسێن؛ ـ هەڵکەر؛ ـ گرسێن؛ ـ دایسێن؛ ـ وەکەر؛ ڕۆشن‌کەر ‹آتش افروز: ئاگرهەڵکەر›.

**افروزنه** / afrûzne'/: *اسم.* دەساگر؛ دەساور؛ چێلە؛ دەستەچێلە؛ دەستەچیلە؛ چیلک؛ دەسەئەیر؛ ئاگرگیرە؛ ژێرئاگرە؛ شنی؛ چاوە؛ چاوگە؛ چاوکە؛ چاوگ؛ چاڤگە؛ چاو ڕۆشن‌کەرە؛ دەستە پووش و پەلاش بۆ بن ئاگر.

**افروزه** / afrûze'، ـها/: *اسم.* چاوڕۆشنکەرە؛ دەستەچیلەی ئاگر؛ چاوداگیرسێن؛ چاڤکە؛ چاوە؛ چاوگە؛ چاوکە؛ دەستەچیلەی چاوەی

ئاگر؛ چاوگ؛ چێله؛ کەرەسەی سەرەتایی بۆ ئاگر هەڵکردن؛ پووش و وردەداری ئاگر کردنەوە.

**افریقائی** / 'efrîqā'î / ☜ **اِفریقایی**

**افریقایی** / 'efrîqāyî / ☜ **آفریقایی: افریقائی**

**ـ افزا** / 'afzā، ـها؛ ـیان/: *پیوازه.* ـگەشێن؛ ـبووژێن؛ زیادکەرەوە ‹روحافزا: گیانگەشێن›.

**ـ افزائی** / 'afzā'î / ☜ **ـ افزایی**

**افزار** / 'afzār / ☜ **ابزار**

**افزارمند** / 'afzārmand، ـها؛ ـان/: *اسم.* پیشەوەر؛ ئامرازمەند؛ کەسێ کە کاری بە ئامراز جێبەجێ دەبێ: **ابزارمند**

**افزایش** / 'afzāyeš، ـها/: *اسم.* ۱. زۆر بوون ‹افزایش قیمت: زۆربوونی نرخ› ۲. زۆرتر کردن؛ پترکردن؛ زیادکردن ‹افزایش دادن: زۆرتر کردن› ۳. *[نامتداول]* کۆ؛ زێدەیی.

⊡ **افزایش دادن:** زۆرکردن؛ پترکردن؛ زێدە کردن؛ فرەکردن؛ فرەکەردەی.

**افزایش یافتن:** زۆرەوە بوون؛ فرەوە بوون.

**افزاینده** / 'afzāyande/: *صفت.* *[نامتداول]* زێدەکەرەوە.

**ـ افزایی** / 'afzāyî/: *پیوازه.* ـ زیادکەرەوەیی؛ زیاکردن؛ فرەکردنەوە ‹دانشافزایی: زانست زیادکردن›: **افزائی**

**افزودن** / 'afzûdan/: *مصدر. متعدی. لازم.* *[ادبی]* // **افزودی:** زیادت کرد؛ **می‌افزایی:** زیاد دەکەی؛ **بیفزا:** زیادکە// ۱. *[نامتداول]* خستنە سەر؛ زیادکردنی شتێک بە شتێکی تر ‹۱۰۰ را بە ۱۷۵ افزودن: ۱۰۰ خستنە سەر ۱۷۵› ۲. زیادکردن؛ فرەکردن؛ زۆرترکردن ‹افزودن حقوق کارگران: زیادکردنی مووچەی کرێکاران› ◻*لازم.* ۳. زۆر بوون؛ زیاد بوون ‹افزودن جمعیت: زیاد بوونی ئاپۆرە›.

■ صفت فاعلی: **افزاینده** (زیادکەرەوە)/ صفت مفعولی: **افزوده** (زیادکراوە)/ مصدر منفی: **نَیَفزودن** (زیاد نەکردنەوە)

**افزودنی** / 'afzûdanî، ـها/: *اسم.* هەژی؛ هەرکام لەو کەرەسانە کە بۆ باشتر بوونەوەی لۆری بەرهەمێک (وەک چێژ، ڕەنگ، پتەوی و...) پێی زیاد ببێ.

**افزوده** / 'afzûde/: *صفت.* زیادکراوە؛ زۆرکراوە؛ زێدەکری.

**افزون** / 'afzûn/: *قید.* *[ادبی]* پتر؛ زۆرتر؛ فرەتر؛ زیاتر؛ زێدەتر؛ بانتر؛ فێشتەر؛ فرەتەر؛ ‹افزون از هزار کس: پتر لە هەزار کەس›.

⊡ **افزون بودن:** پتر بوون؛ زیاد بوون؛ زۆر بوون؛ فرە بوون؛ فێشتەر بیەی. هەروەها: **افزون شدن؛ افزون کردن**

**افزونخواهی** / 'afzûnxāhî، ـها/: *اسم.* فرەخوازی؛ زیادەخوازی؛ پترخوازی؛ زێدەخازی؛ حەز بە وەدەسهێنانی پتر لە ماف و لێهاتوویی. هەروەها: **افزونخواه**

**افزونی** / 'afzûnî، ـها/: *اسم.* *[ادبی]* زۆری؛ زیایی؛ زێدەیی؛ بار و دۆخی زۆر بوون.

**افساد** / 'efsād/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* خراپەکاری؛ گەندەڵ/ گەندەڵەکاری ‹کسانی کە بە افساد و توطئە مشغولند: ئەوانەی وا خەریکی گەندەڵکاری و پیلانن›.

**افسار** / 'afsār، ـها/: *اسم.* هەوسار؛ هۆسار؛ وەسار؛ وسار؛ فسار؛ هەڤسار؛ ئاوسار؛ ئەوسار؛ دەسکەریشە؛ دوخ هەڤسار؛ دەسکەوسار؛ جەڵەو؛ جڵەو؛ کلکەلغاو؛ کلکەڕەشە؛ جەلەب؛ دزگین؛ پالەنگ؛ جڵەوە؛ ڕەشە؛ لغاو؛ دەستەجڵەو؛ دەستەوسار؛ پەتی بەستن و ڕاکێشانی مالات؛ پەتێ کە دە ملی حەیوان دەخرێ و ڕادەکێشرێ.

⊡ **افسار پاره کردن:** *[کنایی]* پەت بڕین؛ هەوسار چڕاندن؛ بەرهەڵدا بوون؛ بەرەڵلا بوون؛ یاخی بوون؛ ئەشقی بوون؛

سەربزێوی کردن ‹باز امروز شاگرد آزاد افسار پاره کرده بود: ئەمڕۆ دیسانەوە شاگردەکەی ئازاد، پەتی بریبوو›.

**افسار خود را بەدست کسی دادن:** *[تعریض]* هەوساری خۆ بەدەستی کەسێکەوە دان؛ لەغاوی خۆ بە دەس کەسێکەوە دان؛ خۆ بە کەسێ سپاردن.

**افسار را شُل کردن:** *[کنایی]* هەوسار بۆ شل کردن؛ سەختگری نەکردن؛ هەفسار سست کرن؛ ئازادی زۆر و نەگونجاو پێدان.

**افسار را کشیدن:** *[کنایی]* هەوساندن؛ ڕاهێنان؛ بەر بە لاساری کەسێ گرتن.

**افسار زدن:** *[کنایی]* هەوسارکردن؛ لەغاو کردن؛ دامرکاندن؛ هێنانە ژێر ڕکێفی خۆ؛ بەر بە بێسەرە و بەرەیی و بێگەڤی گرتن.

**افسار سر خود بار آمدن:** *[کنایی]* لەغاو شل بوون؛ بەرەڵلا بارهاتن.

**افسارش را سر خودش زدن:** *[کنایی]* وێل کردن؛ بەرەڵلا کردن؛ بەرهەڵدا کردن.

**بی افسار آب خوردن:** *[کنایی]* ئاوی بێ لەغاو خواردن؛ بێ گەورە و مامۆستا بوون.

**افسارگسسته** / afsārgosaste'/ ☜ **افسار گسیخته**

**افسارگسیخته** / afsārgosîxte'، ـها؛ ـگان/: صفت. *[کنایی]* پەتبڕاو: ١. سەرکێش؛ سەربزێو ٢. هەرزە؛ سەرچڵ * **عنان‌گسیخته؛ عنان‌گسسته؛ افسارگسسته**

**افسانه** / afsāne'، ـها/: اسم. ١. دیرۆک؛ چیرۆک؛ ڕووداوی خەیاڵی؛ شتێ کە نەبووە و بە خەیاڵ دروست کراوە ‹این افسانه است: ئەمە دیرۆکە› ٢. *[کنایی]* چیڤانۆک؛ ڕووداوێکی ناڕاست کە ناکرێ و نەکراوە.

⊡ **افسانه شدن:** *[کنایی]* ١. ئەوسا بوون؛ لەنێو چوون ٢. کۆنە بوون؛ ناوێک لێ مان و بەس.

**افسانه ای** / afsāne'î'/: صفت. خەیاڵی: ١. بە بار و دۆخی دیرۆکی و خەیاڵییەوە ‹پهلوان افسانه‌ای: پاڵەوانی خەیاڵی› ٢. *[مجازی]* هەژەند؛ سەیر و سەمەرە و نائاسایی ‹قصر افسانه‌ای: کۆشکی خەیاڵی›.

**افسانه پرداز** / afsānepardāz'، ـها؛ ـان/: اسم. دیرۆکدارێژ؛ دیرۆکنووس؛ دیرۆکساز؛ دیرۆکهۆن: **افسانه‌ساز**

**افسانه‌ساز** / afsānesāz'/ ☜ **افسانه‌پرداز**

**افسانه‌سرا** / afsānesarā'، ـها؛ ـیان/: اسم. دیرۆکهۆن؛ دیرۆکبێژ؛ هۆنەر یان وێژەری دیرۆک.

**افست** / ofset'/: [انگلیسی] اسم. *[چاپ]* ئوفسێت؛ شێوەیێکی چاپە کە نووسراوە دەکەوێتە سەر زینک و لە ماشێنی چاپدا، زینکەکە دەیخاتە سەر کاغەز.

**افسر** / afsar'/: اسم. ١. ـها *[ادبی]* تاج؛ پۆپ؛ پۆشە ٢. ـان *[نظامی]* ئەفسەر؛ قوماندار؛ زافت؛ خاوەن پلە لە سوپادا.

⊡ **افسر ارتش:** ئەفسەری ئەرتەش؛ قوماندای لەشکری.

**افسردگی** / afsordegî'، ـها/: اسم. ژاکاوی؛ چرووساوی؛ داچەکاوی؛ دژداماوی؛ عاجزی؛ ئەوگاری؛ کزی: ١. نەبوونی خۆشی و سەرحاڵی ٢. *[روان‌شناسی]* بار و دۆخێکی دەروونییە هاوڕێ لەگەڵ دڵگرانی، دڵساردی و ماندوویی، زۆرتر دڵەخورپێ و کەم بوونەوەی ئیشتیا و بێ‌خەویشی لەگەڵدایە.

**افسردن** / afsordan'/: مصدر. لازم. *[ادبی]* //**افسردی:** ژاکای؛ **افسرده می شوی:** دە ژاکێی؛ **افسرده شو:** بژاکێ// ١. ژاکان؛ کز بوون؛ چرووسان؛ داچەکین؛ کەیل بیەی؛ ژاکیەی؛ خەمگین و دڵتەنگ بوون ٢. *[نامتداول]*

کوژانەوە؛ ئەوەکوشیەی ۳. *[نامتداول]* ساردەوە بوون ٤. *[نامتداول]* ڕچیان؛ بیەی.

■ صفت مفعولی: **افسرده** (ژاکاو) / مصدر منفی: **نَیفسردن** (نەژاکیان).

**افسرده** / afsorde'/: *صفت*. ۱. ـەها؛ ـگان / داچەکاو؛ دوژ؛ کز؛ ژاکاو؛ چرمسیو؛ دژداماو؛ دوش؛ دژ؛ گرژ؛ مەرس؛ چروساو؛ کورە؛ قوژگە؛ عێرز؛ زمیر؛ دڵتەنگ؛ دڵمەردە؛ خەمین؛ پەژار ۲. ـەها/ *[روان‌شناسی]* ژاکاو؛ تووشی ژاکاوی هاتوو ۳. *[نامتداول]* خاموش؛ وەکوژاو؛ کوژاوە؛ دامرکاو؛ ئەوەکوشیا ٤. *[نامتداول]* سارد؛ سەرد؛ سار؛ چیاگ؛ سەرد و سڕ ٥. *[نامتداول]* ڕچاو؛ ڕچیاگ؛ ڕچیا؛ بیا؛ یەخ‌کردوو؛ سەهۆڵ‌بەستوو. هەروەها: **افسرده بودن؛ افسرده شدن؛ افسرده کردن**

**افسرده‌خاطر** / afsordexāter'/: [فارسی/ عربی] ☜ **افسرده‌دل**

**افسرده‌دل** / afsordedel' ، ـەها؛ ـان/: *صفت*. ۱. خەمگین؛ خەمبار؛ نمووز ۲. دڵشکاو؛ دڵ‌پەژمراو؛ دڵ‌ژاکاو؛ دڵ‌تەمراو؛ دڵ‌مرکاو؛ دڵسار؛ زێڵ‌ئەوگار ✻ **افسرده‌خاطر**

**افسری**[۱] / afsarî'/: *اسم*. ئەفسەری؛ پیشەی ئەفسەر.

**افسری**[۲]: *صفت*. ئەفسەری؛ پێوەندیدار و سەر بە ئەفسەر ‹دانشکده‌ی افسری: زانکۆی ئەفسەری›.

**افسنتین** / afsantîn'/، ـەها/: [معرب از یونانی] *اسم*. گوڵ هەنگ؛ گوڵە بەڕۆنە؛ گوڵەزەرد؛ گوڵەڕیزان؛ گوڵەڕۆمینە؛ گۆڵەڕۆنینە؛ گوڵەمەشکە؛ گیاخاو؛ گوڵەمارانە؛ ئاڵفێکی گەلاتووکنی گوڵ‌زەرد و بچووکە و بۆ دەرمان ئەشی: **افسنطین**

**افسنطین** / afsantîn'/: [معرب از یونانی] ☜ **افسنتین**

**افسوس**[۱] / afsûs'/، ـەها/: *اسم*. پەژارە؛ کوڵ؛ کەسەر؛ کوڤان؛ زویری؛ جەخار؛ خەم یان پەژیوانی لە دەستدانی شتێ.

⊡ **افسوس خوردن**: داخ لێهاتن؛ حەیف هاتن؛ داخبار بوون؛ ئاخین؛ ئاخین و داخین؛ خەمخواردن بۆ لە دەستدانی شتێ؛ خەم بۆ خواردن.

**افسوس**[۲]: *صوت*. داخم؛ پەکوو؛ حەیف؛ بەداخەوە؛ مخابن؛ ئاخ؛ دەردۆ؛ ئای؛ تەمتەقۆ؛ حەیف و خەسار؛ ئەک؛ ئەک‌ودەک؛ حەیفێ؛ وشەیەکە بۆ دەربڕینی ناکامی و لە کیس دانی شتێک ‹افسوس که چه زود گذشت!: داخم که چەند زوو تێپەڕی!›.

**افسون** / afsûn'، ـەها/: *اسم*. ئەفسوون: ۱. کارێ کە ئەفسوونکار بۆ هەڵخڕاندنی کەسێ یان شتێک دەیکا ۲. جادوو؛ سیحر ۳. *[کنایی]* فوون؛ فریو؛ فوو؛ گزی و فزی؛ فاک‌وفیک؛ دەهۆ؛ فێڵ و تەڵەکە.

⊡ **افسون خواندن**: فوو پێداکردن؛ خوێندنی وشە و ڕستەگەلێک بۆ جادوو کردن. هەروەها: **افسون کردن**

**افسونگر**[۱] / afsûngar' ، ـەها؛ ـان/: *اسم*. سیحرباز؛ جادووگەر؛ ئەفسوونکار.

**افسونگر**[۲]: *صفت*. ئەفسوونکار: ۱. خاوەنی بار و دۆخی ئەفسوونکاری ۲. *[مجازی]* زۆر جوان و دڵڕفێن؛ خوشیک؛ سپەهی؛ دلحەپین.

**افسونگری** / afsûngarî'، ـەها/: *اسم*. ئەفسوونکاری: ۱. کار یان ڕەوتی ئەفسوون کردن؛ سێرکرن ۲. کار یان پیشەی ئەفسوونکار.

**افشا** / efšā'/: *اسم*. کار یان ڕەوتی درکان/ درکاندن؛ بەرمەلا بوون/ کردن؛ دەرکەوتن/ دەرخستن؛ کەوتنەڕوو/ خستنەڕوو؛ زریان/ زراندن؛ بلاو بوونەوە/ کردنە وە؛ ئاشکرا بوون/ کردن.

▣ **افشا شدن:** بەرمەلا بوون؛ دەرکەوتن؛ ئاشکرا بوون؛ درکان؛ زڕان؛ بەلاقە بوون.
**افشا کردن:** زڕاندن؛ لێ هلدان؛ ڕاستی لێ گوتن؛ درکاندن؛ نهێنی لە کەسێ ئاشکرا کردن.

**افشار**[1] / 'afšār/: *اسم.* ئەفشار؛ خانۆکەی پێنجەمینی تەختەی نەردێن.

ــ **افشار**[2]: *پیواژە.* ١. ــگووشراو؛ ــگووشاو؛ ــشوار؛ گووشیو؛ کوشراو؛ گووشێنراو ‹دستافشار: دەس‌گووشراو› ٢. *[ادبی]* ــدەسەک؛ ــسەک؛ یار؛ یاریدەر؛ دەس؛ ئاریکار ‹دزدافشار: دزدەسەک›.

**افشاری** / 'afšārî/: [ترکی] *اسم. [موسیقی]* ئەفشاری؛ ئاوازێک لە دەسگای شوور لە مووسیقای ئێرانیدا.

**افشاگر** / 'efšāgar/، ــها؛ ــان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* قاودەر؛ ئاشکراکەر؛ درکێنەر؛ بەرمەلاکەر؛ جارچی؛ خاوەنی بار یان دۆخی ئاشکراکەری ‹سخنان افشاگر: قسەگەلی قاودەر›.

**افشاگرانه**[1] / 'efšāgarāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بەرمەلاکەرانە؛ ئاشکراکەرانە؛ قاودەرانە ‹مقالەی افشاگرانه: وتاری قاودەرانە›.

**افشاگرانه**[2]: *قید.* قاودەرانە؛ بە ئاشکرایی؛ ئاشکرایانە ‹استاد افشاگرانه سخن می‌گفت: ماموستا قاودەرانە قسەی دەکرد›.

**افشاگری** / 'efšāgarî/، ــها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* قاودەری؛ کار یان ڕەوتی دەرخستنی ئاکار یان ڕووداوێکی ناڕەوا ‹از بعضی از افشاگری‌ها باید اجتناب کنید: لە برێک قاودەرییگەل دەبێ دووری بکەن›.

**افشان**[1] / 'afšān/: *اسم.* شەن؛ شەنە؛ سێزنە؛ سێزن؛ ملهێب؛ داری چوارچنگی خۆیان بە بادان.

ــ**افشان**[2]: *پیواژە.* ــوەشێن؛ ــپژێن؛ ــپرژێن؛ ــپرژۆل؛ ــوەشان؛ ــشان؛ ــشەن؛ ــچێن؛ ــپاش ‹بذرافشان: تۆوەشێن›.

**افشاندن** / 'afšāndan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**افشاندی:** وەشاندت؛ **می‌افشری:** دەوەشێنی؛ **بیفشر:** بوەشێنە// ١. بلاوکردن؛ وەشاندن؛ پژاندن؛ پشاندن؛ چاندن؛ داچاندن؛ پاشەی؛ شانەی؛ شای ‹تخم افشاندن: توو وەشاندن› ٢. پرژاندن؛ پژگنەی؛ بە تەوژمەوە پژاندن ‹آب افشاندن: ئاو پرژاندن› ٣. ڕاوەشاندن؛ تەکاندان؛ وەشاندن؛ ڕاتلەکاندن؛ ڕاشەکاندن؛ تەکنەی؛ شۆکنایەوە؛ ئەوەشۆکنەی ‹دست افشاندن: دەست ڕاتلەکاندن› ٤. *[ادبی]* بەخت کردن؛ لە پێناو نان؛ قوربان کردن؛ گۆری کردن ‹جان افشاندن: گیان بەخت‌کردن› ❊ **فشاندن؛ افشانیدن**

هەروەها: **افشاندنی**

■ صفت فاعلی: **افشاننده** (وەشێنەر) / صفت مفعولی: **افشانده** (وەشێنراو) / مصدر منفی: **نَیفشاندن** (نەوەشاندن)

**افشانندگی** / 'afšānandegî/: *اسم.* وەشێنەری؛ پژێنەری؛ داچێنەری؛ بە تایبەتمەندی وەشاندن یان وەشێنەر بوونەوە.

**افشانه** / 'afšāne/، ــها/: *اسم.* پژێنەک؛ پژانە؛ دەزگا یان کەرەسەیێ کە تراو دەپژێنێ.

**افشانیدن** / 'afšānîdan/ ☜ **افشاندن**

**افشردگی** / 'afšordegî/: *اسم.* گووشراوی: ١. دۆخی گووشراو بوون ٢. کوشراوی؛ گووشیاگی؛ گڤاشتی؛ گووشیوی؛ گووشیاوی؛ تێک‌گووشراوی؛ کاری لە نێو یەکدا گووشران.

**افشردن** / 'afšordan/: *مصدر. متعدی. [نامتداول]* //**افشردی:** گووشیت؛ **می‌افشری:** دەگووشی؛ **بیفشر:** بگووشە// گووشین؛ گڤاشتن: ١. گووشان؛ گوشین؛ گووشانن؛

کوشین؛ کوشان؛ بشافتن؛ پشاوتن؛ شواره ی؛ شوارای؛ شوارتەی؛ هەڵپشاوتن؛ گوشاردان ۲. بشاوتن؛ ئاو یان شیرەی شتێ بە گوشار گرتن. هەروەها: **افشردنی**

■ صفت فاعلی: **افشرنده** (گووشەر) / صفت مفعولی: **افشرده** (گووشراو) / مصدر منفی: **نَیفشردن** (نەگووشین)

**افشرده** / 'afšorde/: اسم. گووشراو؛ گووشراوە؛ ئەو شتەی کە ئاوەکەی بە گوشاردان گیراوە.

**افشره** / 'afšore، ـها/: اسم. گوڤیشک؛ گووشراو؛ شیلە؛ گڤیشک ‹افشردەی لیمو: گووشراوی لیمۆ›.

**افشک** / 'afšak، ـها/: اسم. [نامتداول] ۱. پرشە؛ پژگە؛ پریشکە؛ پرشنگ؛ پژە؛ پرشەی ئاو ۲. شەونم؛ ئاونگ؛ ئاڵشتە * **افشنگ**؛ **اپشک**

**افشنگ** / 'afšang/ ☜ **اَفشَک**

**افشون** / 'afšûn/: اسم. شەن؛ شەنە؛ شە؛ کاریچ؛ کاریچ؛کارێژ؛ تەبور؛ شەمز؛ ملهێب؛ ملێب؛ مەلەهەب؛ مەلیف؛ مالیب؛ سیلکە؛ سێزن؛ قەلەپیسک؛ هەسک؛ هیرگووش؛ داری چوارچنگی خەرمان بادان.

▣ **افشون آهنی**: شەن؛ کادۆ؛ شەنەی ئاسن.

**افشون سەشاخه**: گۆ؛ سێلک؛ شەناسێ؛ شەنەی سێددانە.

**افشه** / 'afše، ـ ها/: اسم. ساور؛ ساوار؛ ساڤار؛ گەنمی کوڵاوی بەدەستاڕ وردکراو: **بلغور**

**افضل** / 'afzal/: [عربی] صفت. [ادبی] ۱. هەڤیاز؛ باشتر؛ سەرتر ۲. زاناتر؛ هەژیتر؛ هێژاتر؛ قەنجتر.

**افطار** / 'eftār/: [عربی] اسم. بەربانگ: ۱. رۆژووشکێنی ‹افطار کردن: بەربانگ کردنەوە› ۲. /ـها/ ئێوارە؛ وێرە گا؛ کاتی رۆژوو شکاندن ‹زودباش! افطار شد: ئازاکە! بەربانگە›.

▣ **افطار باز کردن** ☜ **افطار کردن**

**افطار کردن**: رۆژوو شکاندن؛ رۆچێ مارەی؛ بەربانگ کردنەوە؛ فتار ڤەکرن؛ رۆژووکردنەوە؛ دەم واکردن؛ شکاندنی رۆژوو: **افطار کردن**

**افطارانه** / 'eftārāne/: [عربی/ فارسی] ☜ **افطاری**

**افطاری** / 'eftārî/: [عربی] اسم. بەربانگی؛ وەربانگی؛ پێخۆرێ کە رۆژگەوان لە کاتی ئێوارەدا دەیخوات: **افطارانه**

**افعال** / 'af'āl/: [عربی] اسم. ۱. جمعِ ☜ **فِعل** ۲. کاران؛ کارگەل؛ کردارگەل؛ کارێ؛ کەردێ ‹افعال ناشایست: کارانی نالەبار›.

**افعی** / 'af'î، ـها؛ ـان/: [عربی] اسم. حەفی؛ کولەژ؛ کەوهەفی؛ بەرگیر: ۱. ناوی گشتی ئەندامانی تیرەی حەفیان ۲. ماری ژاردار لە تیرەی حەفیان.

**افغان** / 'afqān/: اسم. ۱. /ـها؛ ـان / ئەفغان؛ خەڵکی وڵاتی ئەفغانستان ۲. [ادبی] شیوەن؛ فەغو؛ هاواری ئازار؛ شین و رۆڕۆ.

**افغانی**[1] / 'afqānî/: اسم. ئەفغانی: ۱. / ـها؛ ـان؛ افاغنه/ ئەفغان؛ هەر یەکە لە خەڵکی رەسەنی ئەفغانستان ۲. یەکەی پارەی ئەفغانستان.

**افغانی**[2]: صفت. ئەفغانی: ۱. سەر بە ئەفغانستان ۲. / ـها/ خەڵکی ئەفغانستان.

**افق** / 'ofoq، ـها؛ آفاق/: [عربی] اسم. ئاسۆ: ۱. ئاسۆگ؛ ئاسوو؛ هاسۆ؛ هەسۆ؛ ئەوسۆ؛ سوو؛ سوێ؛ سوێگە؛ ماک؛ ماکە؛ کەل؛ نشات؛ ئاوا؛ زێواری ئاسمان؛ پەراوێزی ئاسمان؛ کەناری ئاسمان ۲. [مجازی] بەرژەوەند؛ بەرجەوەن ‹افق روشن: ئاسۆی روون›.

**افقی** / 'ofoqî/: [عربی] صفت. هەسۆیی؛ ئاسۆیی؛ ئاسۆگی. ۱. سەر بە ئاسۆ ۲. پۆیی؛ هاوشان / هاوڕێکی ئاسۆ.

**افکار** / afkār'/: [عربی] جمعِ ☜ **فِکر**

▣ **افکـار عمـومی**: بـیری گـشتی؛ بـیر و ڕای گشتی؛ بۆچوونی پڕایی گەل.

**ـ افکن** /afkan'/: *پیواژه.* ۱. ـبـەزێـن؛ ـبـەزەنـە ‹شـیرافکن: شـێربەزێـن› ۲. ـهـاوێژ؛ ـئـاوێژ؛ ـتاونـە ‹پرتـوافکن: تیـشکاوێژ› ۳. ـهـاوێژ؛ ـشان؛ فڕێدەر ‹بمبافکن: بۆمبهاوێژ›.

**افکنـــدن** / afkandan'/: *مـصدر. متعـدی.* //**افکنـدی**: هاویـشتت؛ **مـی‌افکنـی**: دەهـاوێژی؛ **بـیفکن**: بهـاوێژە// ۱. هاویـشتن؛ خـستن؛ خـسن؛ شـانەی؛ فـڕەدان؛ بـرک/ بـڕک‌دان؛ برنـگ‌دان؛ تـووڕدان ۲. ڕاخـستن؛ داخـستن؛ ئـەرەیـاوەی؛ ئـەرەوسـەی ‹فرش افکندن: فـەش ڕاخـستن› ۳. داخـستن؛ شـۆڕەوەکـردن؛ وسەیرە؛ ئـاردەیـەر وار؛ هێنانـە خـوار ‹سر را بـە زیـر افکنـدن: سـەر داخـستن› ٤. خـستن؛ تیـشکدان؛ تیـشک هاویـشتن؛ شـانەی؛ تاونایـنە ‹پرتو افکندن: تیشک هاویشتن›.

■ صـفت فـاعلی: **افکننـده** (هـاوێژەر)/ صـفت مفعـولی: **افکنـده** (هـاوێژراو)/ مـصدر منفـی: **نَیفکندن** (نەهاوێشتن)

**افگـار** / afgār'/: *صـفت. [ادبـی]* ئـەوگـار؛ دامـشتی: ۱. کـز؛ دامـاو؛ کـەیـل؛ زگـار؛ مانیـا؛ ئاراو؛ سیس هەڵگەڕاو ۲. بریندار؛ زامار.

**افگانـه** / afgāne'/: *اسم.* لـە بـەر/ بـار چـووگ؛ بێچووی بە مردوویی زاو.

**افـلاس** / eflās'/: [عربـی] *اسم. [ادبـی]* دامـاوی: ۱. هـەژاری؛ ڕووتی؛ دەسـکورتی؛ بـەلـەنگـازی ‹از فـرط افـلاس بـه فـروش لباسهای اضـافی خـود پرداخـت: لـەبـەر هـەژاری کـەوتـە فرۆشـتنی جـلوبـەرگـە زیـادەکـانی خـۆی› ۲. نـابوودی؛ نـابووتی؛ وەرشکـستەیـی؛ مایـەپـووچی ‹ایـن طور که تو خرج می کنی مـی ترسم کـارت بـه افـلاس بکشد: بەم جـۆرە کـە تـۆ خـەرج دەکـەی ئـەترسـم بکەویتە نابوودی›.

**افلاسـنامه** / eflāsnāme'، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] *اسم.* هـەژارینامـە؛ نووسـراوەیـەک کـە تێیـدا هەژاری کەسێک ڕادەگەیەنن.

**افـلاک** / aflāk'/: [عربـی] *اسـم.* ۱. جمـعِ ☜ **فَلَک** ۲. *[ادبی]* ئاسمانان؛ ئاسمانگەل؛ ئاسمانێ.

**افـلاک‌نمـا** / aflāknamā'، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] *اسم.* کـەرەسـەیـەک کـە بـە گـەڕان و وەرچەرخـان بـە یارمـەتی چـەرخدەنـدە، جێگـا و جووڵەی تەنە ئاسمانیەکان نیشان دەدات.

**افلاکـی**[1] / aflākî'، ـهـا؛ ـان/: [عربـی] *اسـم. [ادبی]* هەسارەناس؛ ئەستێرەناس.

**افلاکـی**[2] / ـان/: *صفت.* ئاسمـانی؛ پێـوەندیـدار یان سەر بە ئاسمان.

**افلیج** / eflîc'/: [از عربی] ☜ **مَفلوج**

**افنا** / efnā'/: [عربی] *اسم. [ادبی]* لـە نێـو بـە ری؛ لە بەیـن بـەری؛ فـەوتێنـەری؛ کـار یـان ڕەوتی هەڕشاندن/ هەرژاندن و تیا بردن.

**افنـدی** / afandî'، ـهـا؛ ـان/: [ترکـی از یونـانی] *اسم.* ئـەفـەنـدی؛ ئاغـە؛ وشـەی ڕێـز لێنـان بـۆ پیاوان لە تورکیەدا.

**افواج** / afvāc'/: [عربی] جمعِ ☜ **فَوج**

**افــواه** / afvāh'/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* زاران؛ دەمگـەل ‹ایـن شـایعه در افـواه افتـاد: ئـەم دەنگۆیـە کەوتە سەر زاران›.

**افواهـاً** / afvāhan'/: [عربـی] *قیـد.* دەمـی؛ بـە دەمی؛ بە دەم؛ بە زار؛ زارەکی؛ سەرزارەکی.

**افــواهی**[1] / afvāhî'/: [عربـی] *صـفت. [گفتـاری]* ۱. *[نامتـداول]* دەمـی؛ زارەکـی؛ سـەرزارەکـی؛ نـەنووسـراو ۲. *[مجـازی]* دەمـی؛ دەڤـکی؛ هەرچی ڕاست یان درۆی دیار نەبێ.

**افــواهی**[2]: *قیـد.* ۱. دەمـاودەم؛ دەمبـەدەم؛ بـە شێوەی دەمـی ۲. دەمـی؛ دەڤـکی؛ بـە شـێوەی دەنگۆ و دەنگەشە.

**افــول** / ofûl'/: [عربـی] *اسم. [ادبـی]* ۱. ڕەوتی ئـاوا بـوون؛ داکـشانی تـەنی ئاسمـانی بـەرەو

ئاسۆی ڕۆژاوا ‹افول ماه: ئاوابوونی مانگ› ۲. *[مجازی]* پووکانەوە؛ پووچانەوە؛ ڕووخان؛ دارمان؛ داهاتن؛ کار یان ڕەوتی لە دەست دانی پلە و ئاست ‹افول قدرت شاه: پووکانەوەی هێزی شا›. هەروەها: **افول کردن**

**افه** / efe'، ـها/: [فرانسوی] *[اسم]* نوان: ۱. *[گفتاری]* با؛ خۆ نوێنی؛ ئەدا؛ ئەتوار ۲. نوانگەی تایبەتی (سینەما).

▣ **افه آمدن:** خۆ نواندن؛ خۆبادان؛ جموجووڵگەلی نمایشی بۆ خۆ ڕانان و کێشاندنی سەرنجی خەڵک بۆ لای خۆ.

**افیون** / afyûn'/: [معرب از یونانی] *[اسم]* *[ادبی]* تریاک؛ تلیاک.

**افیونی** / afyûnî' ، ـها؛ ـان/: [معرب از یونانی] *صفت*. تریاکی؛ تریاک کێش.

**اق** / oq'/ ☜ **عُق**

**اقارب** / aqāreb'/: [عربی] *[اسم]* *[ادبی]* ۱. کەس‌وکار؛ نزیکگەل؛ نزیکەیل؛ خزمان ‹اقارب درجه اول: کەس و کاری پلەیەکەم› ۲. نزیکان ‹از اقارب حاکم بود: لە نزیکانی حاکم بوو› ❊ **آقربا**

**اقاریر** / aqārîr'/: [عربی] جمعِ ☜ **اِقرار**

**اقاصی** / aqāsî'/: [عربی] جمعِ ☜ **أقصا**

**اقاقی** / aqāqî' ، ـها/: [معرب از یونانی] *[اسم]* *[گفتاری]* ☜ **آقاقیا**

**اقاقیا** / aqāqiyā'، ـها/: [معرب از یونانی] *[اسم]* عەناوە؛ ئاقاقیا؛ دار بیسمیللا؛ دار جەوی؛ ئەکاکی؛ دار دەرزی: **اقاقی**

**اقاله** / eqāle'/: [عربی] *[اسم]* *[حقوق]* ڕێککەوتنی دوولایەنی مامڵە بۆ هەڵوەشاندنەوەی پێکهاتە.

**اقالیم** / aqālîm'/: [عربی] جمعِ ☜ **اِقلیم**

**اقامت** / eqāmat'/: [عربی] *[اسم]*. دیماتی؛ ئاکنجێتی؛ نیشتەجێیی؛ گلەوبەری؛ کار یان ڕەوتی جێ خۆش کردن و مانەوە لە شوێنێک؛ مەنەی ‹محل اقامت دایم: شوێنی نیشتەجێیی هەمیشە›.

▣ **اقامت داشتن:** مانەوە؛ جێگیر بوون؛ نیشتەجێ بوون؛ مانگار بوون؛ دامەزران؛ مەنایوە ‹سه سال در بانه اقامت داشت: سێ ساڵ لە بانەدا نیشتەجێ بوو›. هەروەها: **اقامت کردن؛ اقامت گزیدن**

**اقامتگاه** / eqāmatgāh'، ـها/: [عربی/ فارسی] *[اسم]*. نشیمەن؛ نشیمەنگا؛ نشینگە؛ جێگەی مانەوە و نیشتەجێ بوون (وەک ماڵ، میوانخانە و...).

**اقامه** / eqāme'/: [عربی] *[اسم]*. ۱. کار یان ڕەوتی بەجێ هێنان؛ بەرپا کردن؛ بەڕێوە بردن ‹اقامەی نماز: بەڕێوەبردنی نوێژ› ۲. قامەت؛ بانگی پێش لە نوێژ، بۆ ڕیز بەستن و نوێژ خوێندن: **اذان و اقامه**

▣ **اقامەی نماز:** قامەت بەستن؛ نوێژ دابەستن؛ دەست پێکردنی نوێژ و نیەت هاوردن.

▣ **اقامه کردن:** هێنانە گۆڕێ؛ خستنە گۆڕێ؛ قسەی شتێ داهاوردن.

**اقانیم** / aqānîm'/: [عربی] جمعِ ☜ **أقنوم**

▣ **اقانیم ثلاثه** ☜ **أقنومهای سه‌گانه، أقنوم**

**اقاویل** / aqāvîl'/: [عربی] *[اسم]* *[ادبی]* ۱. جمعِ ☜ **قَول** ۲. گفتگەل؛ گفت و وات؛ قسەگەل.

**اقبال** / eqbāl'/: [عربی] *[اسم]*. ۱. بەخت؛ هاتی؛ هات؛ ناوچاو؛ کابە شاک؛ ڕوچە؛ چارە؛ ئامەد؛ ئامەو؛ تاڵە؛ ڕێکەوتی باش و دڵخۆشکەر ‹اقبال او بلند است: بەختی ئەو بەرزە› ۲. پێشواز؛ ڕووتێکەری ‹با اقبال مردم روبرو شد: لەگەڵ پێشوازی خەڵکیدا ڕووبەڕوو بووەوە›.

▣ **اقبال رو آوردن:** بەخت ڕوو تێکردن؛ ناوچاو هاوردن؛ بەختەوەر بوون؛

خۆشبەخت بوون.

**اقبال کردن**: پێشوازی لێکردن؛ قەبووڵ کردن؛ وەرگرتن؛ بەرەو پیری چوون.

**اقتباس** / eqtebās'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. لێوەرگری؛ کار یان ڕەوتی کەڵک وەرگرتن لە بەرهەم و بیری کەسانی تر، بۆ داهێنانی کارێکی نوێ.

◘ **اقتباس کردن**: لێوەرگرتن؛ هەڵگرتنەوە؛ وەرگرتن؛ ژێوەرگرتن؛ چنەگێرتەی؛ هێنان؛ دەرهێنان؛ دەرکێشان؛ گرتنی ناوەرۆک یان بیرێک و بەکارهێنانی بە شێوەیێکی تر.

**اقتدا** / eqtedā'/: [عربی]/اسم. شوێنکەوتوویی؛ چاولێکەری؛ کار یان ڕەوتی بە دووی کەسێ کەوتن لە کارێکدا و بە سەرمەشق دانانی ئەو کەسە. هەروەها: **اقتدا کردن**

**اقتدار** / eqtedār'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. دەسڕۆیی؛ دەسەلات؛ دەستەلات: ۱. دەسەلاتداری؛ لێهاتوویی لە بەکارهێنانی هێز و دەسەلاتی خۆ لە کاتی دڵخوازدا ‹در آن موقع ارباب ده اقتدار زیادی داشت: لەو کاتەدا ئاغای دێ دەسەلاتێکی زۆری هەبوو› ۲. توانایی کارتێکردن لە سەر ئاکاری دیتران ‹اقتدار سیاسی: دەسەلاتی سیاسی›.

◘ **اقتدار داشتن**: دەسەلاتدار بوون؛ دەسڕۆیشتن؛ دەسڕۆیین. هەروەها: **اقتدار یافتن**

**اقتدارگرایی** / eqtedārgerāyî'، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. [سیاست] دەسەلاتخوازی؛ ئەو ئامۆژیاریە کە باوەڕی بە بوونی حکوومەتێکی دەسەلاتدار و سەردانەواندنی تەواوی خەڵکە بۆ ئەو حکوومەتە. هەروەها: **اقتدارگرا**

**اقتراح** / eqterāh'، ـها؛ ـات/: [عربی/ فارسی] اسم. [ادبی] ڕاوێژ؛ ڕازمووونی؛ پرسین لە خاوەن ڕایان لە مەڕ بابەتێکەوە.

**اقتران** / eqterān'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. لێکنزیکی؛ جووتی: ۱. بار و دۆخی نزیک یەک کەوتن ۲. بار و دۆخی لە یەک ڕیزدا بوون ۳. [نجوم] بەرامبەر بە یەک هاتنەوەی تەنە ئاسمانیەکان.

**اقتصاد** / eqtesād'/: [عربی]/اسم. ئابووری؛ ئابوور: ۱. بەڕێوە بردنی ژیرانەی خەرج و داهات ۲. کۆمەڵە بابەتێک سەبارەت بە پێوەندی هۆرتە و بەرە ۳. زانستی ئابووری؛ زانستی لێکۆڵینەوەی شێوەی ژیانی تاک و کۆمەڵگاگەل و پێوەندی نێوان ئەم شێوە ژیانە و قانوونی زاڵ بەسەریانا و هەروەها دۆزینەوە و پێشنیارکردنی شێوە یان شێوەگەلی تازە بۆ بەرهەم هێنان و دابەشکردنی داهاتەکانی.

**اقتصاددان** / eqtesād.dān'، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئابووریزان؛ کەسێ کە لە بواری قانوون، دیاردە و پێوەندیگەلی ئابووری و مێژوو و کارکردیان، خاوەن زانستە.

**اقتصادسنجی** / eqtesādsancî'، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. کەڵک وەرگرتن لە بیرکاری و ژمێرکۆیی لە خۆندنەوەی بابەتگەلی ئابووری.

**اقتصادی** / eqtesādî'/: [عربی] صفت. ئابووری: ۱. پێوەندیدار بە ئابوورەوە ‹برنامەی اقتصادی: ڕیچی ئابووری› ۲. بە قازانج ‹این کار اقتصادی نیست: ئەم کارە نابووری نیە›.

**اقتصادیات** / eqtesādîyyāt'/: [عربی]/اسم. ئابووریگەل؛ کاروباری سەر بە ئابووری.

**اقتضا** / eqtezā'/: [عربی]/اسم. ویست؛ خواست؛ خواز؛ نیاز؛ پێداویست؛ گەرەکی؛ پێویستی ‹اقتضای زمانە: ویستی سەردەم›.

◘ **اقتضا کردن**: ویستن؛ خواستن؛ واسەی؛

پێویستی کردن؛ پێویست بوون ‹آن روز شرایط این طور اقتضا می‌کرد: ئەو ڕۆژە هەل‌ومەرج ئاوای دەویست›.

**اقدام** / aqdām'/: [عربی] جمعِ ☜ **قَدَم**

**اقـدام** / eqdām'، ــها؛ ـات/: [عربی] /اسم. داپەڕ؛ هاقل؛ دەسبەکاری؛ کار یان ڕەوتی جێبەجێ‌کردنی کارێ‌کە لە پێشدا بەرنامەی بۆ داڕێژراوە ‹اقدام قانونی: داپەڕی قانونی›.

◘ **اقدام کردن**: دەست بردن؛ دەس بەکار بوون؛ کارکردن؛ ئەقل کردن؛ هەوڵدان؛ هەنگاو نان.

**اقـرار** / eqrār'، ــها؛ آقاریر/: [عربی] /اسم. پێهاتی؛ ئیقرار؛ کار یان ئاکارێ کە نیشانەی وەرگرتنی ڕاستی قسەیەکە.

◘ **اقرار کردن**: مکوور بوون؛ پێهاتن؛ چوونە ژێر؛ ئیقرارکردن؛ ڕاستی گوتن؛ دان پێیانان؛ پێ لێنان؛ دان پێدانان؛ پنە ئامەی؛ وە ئەستۆ گرتنی تاوان یان داخوازیەک لە ئاست خۆوە.

**اقرار گرفتن**: پێ‌درکاندن؛ ڕاستی لە بن زار کێشان.

**اقرارنامه** / eqrārnāme'، ــها/: [عربی/ فارسی] /اسم. دەرقەدان‌نامە؛ ئیقرارنامە؛ نووسراوەیێ کە تێیدا نووسەر یا واژۆکەر بابەتێک بدرکێنێ.

**اقرارنیوش** / eqrārnîyûš'، ــها؛ ــان/: [عربی/ فارسی] ☜ **اعتراف‌نیوش**

**اقـران** / aqrān'/: [عربی] /اسم. [ادبی] هاوتایان؛ هاولفان؛ هاوەلان؛ هاومالان؛ هاوشانان؛ هاوتەمەنان؛ هاوقەتاران.

**اقربا** / aqrebā'/: [عربی] ☜ **أقارب**

**اقراهی** / oqor.rāhî'، ــها/: [ترکی/ فارسی] /اسم. [گفتاری] دیاری؛ سەوقات؛ پێشکەشیەک کە ڕێبوار بە بەرێکەرانی دەدا.

**اقساط** / aqsāt'/: [عربی] جمعِ ☜ **قِسط**

**اقساطی** / aqsātî'/: [عربی] ☜ **قِسطی**

**اقسام** / aqsām'/: [عربی] جمعِ ☜ **قِسم**

**اقشار** / aqšār'/: [عربی] جمعِ ☜ **قِشر**

**اقـصا**[1] / aqsā'، اقاصی/: [عربی] /اسم. [ادبی] دوورەدەستان؛ جێگەگەلی زۆر دوور: **اقصی**

**اقـصا**[2]: صفت. دوورتر؛ دوورتەر؛ ئەوپەڕ ‹در اقصای عالم: لە دوورتر شوێنانی جیهاندا›: **اقصی**

**اقـصر** / aqsar'/: [عربی] صفت. [ادبی] کۆتاتر؛ کولتر؛ کورت‌تر؛ کۆتاتەر ‹راه اقصر: ڕێگەی کوتاتر›.

**اقصی** / aqsā'/: [عربی] ☜ **اَقصا**

**اقطاب** / aqtāb'/: [عربی] جمعِ ☜ **قُطب**

**اقطار** / aqtār'/: [عربی] جمعِ ☜ **قُطر**

**اقطاع** / eqtā''، ــات/: [عربی] /اسم. [قدیمی] ئەو هەرد و بوومە خەلیفە یان شا دەیسپاردە کەسێک کە داهاتی بۆ خۆی بێ.

**اقـل** / aqal(l)'/: [عربی] صفت. کەم؛ کەمتر؛ کەمتەر ‹حد اقل: لانی کەم›.

◙ **اقـل مراتـب**: کەمترین پلە؛ نزمترین پلەوپایە.

**اقـلاً** / aqallan'/: [عربی] قید. کەمایی؛ قەنا؛ کێمیقە؛ کەمینە؛ هیچ نەبێ؛ هیچ نەوێ؛ بەشی کەم؛ لانی کەم؛ ئەقەلی کەم.

**اقلام** / aqlām'/: [عربی] جمعِ ☜ **قَلَم**

**اقلیـت** / aqalîyyat'/: [عربی] /اسم. کەمینە؛ کەمایەتی؛ کەمایی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی کە متر بوون ‹اگر این طور رفتار کنی، همیشه در اقلیت می‌مانی: ئەگەر بەم جۆرە هەلسی و دانیشی، هەمیشە لە کەمینەدا دەمێنیتەوە› ۲. /ـها/ بەشێ لە کۆمەلە، کۆمەلگا یان دامەزراوێک کە ژمارەی ئەندامانی کەمتر لە بەشەکانی‌ترە ‹اقلیت دینی: کەمینەی ئایینی›.

◘ **در اقلیت بودن**: لە کەمینەدا بوون؛ لە

کەمایەتیدا بوون: ۱. خاوەنی ئەندام و هۆگری کەم و نەبەس ۲. لەگەڵ ڕای زۆرینەدا نەبوون ۳. دەنگی باش و بەس نەهێنان. هەروەها: **در اقلیت ماندن**

**اقلیم** / eqlîm'، ـها؛ آقالیم/: [معرب از یونانی] /اسم. ۱. وڵات؛ سەرزەمین؛ هەرێم؛ وەڵگ؛ بووم ۲. ئاو و هەوا؛ کەش.

▣ **اقلیم سخن:** هەرێمی شێعر و وێژە.

**اقلیمش** / eqlîmeš'/: [معرب/ فارسی] /اسم. دەڤەرناسی؛ زانستی چۆناوچۆنی گۆڕان و داگەڕانی ئاو و هەوای شوێنێک.

**اقلیم‌شناسی** / eqlîmšenāsî'/: [عربی/ فارسی] /اسم. کەش‌ناسی؛ ئاو و هەواناسی.

**اقلیمی** / eqlîmî'/: [معرب] صفت. کەشی ‹شرایط اقلیمی: هەلومەرجی کەشی›.

**اقمار** / aqmār'/: [عربی] /اسم. [ادبی] ۱. جمعِ ☜ **قَمَر**

**اقناع** / eqnā''/: [عربی] /اسم. [ادبی] هێنانە سەربار؛ کار یان ڕەوتی ڕازی‌کردن ‹او برای اقناع من خیلی تلاش کرد: ئەو بۆ ڕازی کردنی من زۆری تێکۆشا›. هەروەها: **اقناع شدن؛ اقناع کردن**

**اقنوم** / oqnûm'، ـها؛ آقانیم/: [معرب از یونانی] /اسم. [ادبی] ۱. سرشت؛ بناخە؛ بنواشە؛ هیم؛ خۆ ۲. بنەما؛ ئەوەی کە بوونی هەرشتێ بەوەو بەستراوە ۳. کەس؛ خۆ؛ کەسایەتی؛ بنەکۆک؛ شەنگستە؛ بنمیشە.

▣ **اقنوم‌های سه گانه:** سێ بنەمای بنەڕەتی لە دینی مەسیحدا، واتا: باوک، کوڕ، ڕۆحی پیرۆز: **اقانیم ثلاثه**

**اقوال** / aqvāl'/: [عربی] جمعِ ☜ **قَول**

**اقوام** //aqvām: [عربی] جمعِ ☜ **قَوم**

**اقونیطون** / aqûnîtûn'، ـها/: [معرب از یونانی] /اسم. هەلایهەل؛ هەلاهەل؛ گیا ژار؛ گولەگیا.

**اقویا** / aqviyā'/: [عربی] /اسم. دەسەڵاتداران؛ زۆرداران؛ بەهێزان؛ کەسانی بە هێزی کۆمەڵایەتی زۆرەوە.

**اقیانوس** / oqyānûs'، ـها/: [معرب از یونانی] /اسم. ئۆقیانووس؛ زەریای گەورە: ۱. پانایەکی پان و بەرین لە ئاوی سوێر، بە زەریا و دوڕگەگەلی زۆرەوە ۲. هەر یەکە لە پێنج کۆمای بەرینی ئاو کە پێکەوە پتر لە ۷۰٪ ڕووبەری گۆی زەوی داگرتووە.

**اقیانوس‌شناسی** / oqyānûsšenāsî'/: [معرب/ فارسی] /اسم. ئۆقیانووس‌ناسی؛ محیت‌ناسی: **اقیانوس‌نگاری**. هەروەها: **اقیانوس‌شناس**

**اقیانوس‌نگاری** / oqyānûsnegārî'/: [معرب/ فارسی] ☜ **اقیانوس‌شناسی**

**اکابر** / akāber'/: [عربی] /اسم. ۱. تەمەن زۆران؛ بە ساڵا چووان؛ تەمەن‌ڕۆیشتوان؛ گەوراترەیل ۲. [قدیمی] گراگران؛ گەورەگەل؛ خاناژی ‹اکابر قوم: گراگرانی هۆز›.

**اکاذیب** / akāzîb'/: [عربی] /اسم. [ادبی] درەوو؛ درۆ و دەلەسە.

**اکازیون** / okāz(i)yon'، ـها/: [فرانسوی] /اسم. هەڵکەوت؛ هەڵکەفت؛ هەل؛ هۆرکەوت؛ کێس؛ دەلیڤە؛ دەرفەتی باش بۆ هە نگاوێکی پڕقازانج ‹این ماشین با این قیمت، اکازیون واقعی است: ئەم ماشینە بەم نرخەوە، هەلکەوتهیەکی تەواوە›.

**اکالیپتوس** / okālîptûs'، ـها/: [فرانسوی] /اسم. ئۆکالیپتووس؛ دارێکی لە بیچمی دارە بیە، کە لە ئوسترالیاوە هاتووە و گەڵاکەی بۆ دەرمان ئەشێ.

**اکالیپتول** / okālîptol'/: [فرانسوی] /اسم. [شیمی] ئۆکالیپتول؛ شیرەی ئۆکالیپتووس، کە تراوێکی ئاوئاسایە و بۆنێکی تونی هەیە.

**اکبر** / akbar'، اکابر/: [عربی] صفت. [ادبی]

گەورەتر؛ مەزنتر؛ گۆرەتەر؛ گەپتر.

**اکبیری** / 'ekbîrî، ــها/: [از عربی] صفت. [گفتاری] ناحەز؛ ناشیرین؛ ناشیرین؛ دزێو؛ پووتەکە؛ نابار؛ ناباو؛ قرهە؛ نەچێ؛ کرێت؛ بەدتەشک؛ بەدشکڵ.

**اکتبر** / 'oktobr/: [فرانسوی]/اسم. ئۆکتوبر؛ تشرینی یەکەم؛ مانگی دەیەمی ساڵی زایینی، لە نۆی ڕەزبەرەوە تا بیستی خەزەڵوەر.

**اکتساب** / 'ektesāb، ــها؛ ــات/: [عربی]/اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی پەیا کردن؛ وەدەس خستن؛ بەدەسهێنان؛ وەدەسهێنان؛ دەسخستن؛ گیرهێنان؛ دەس وسەی؛ بە دەس ئاردەی؛ پەیدا کەردەی؛ دەستقەنان.

**اکتسابی** / 'ektesābî/: [عربی] صفت. دەسخستنی؛ دەسخستانی؛ دەسخستەکی؛ دەسهێنانی؛ گیرهێنانی؛ پەیاکردنی؛ دەستقنای. بەرانبەر: **فطری**

**اکتشاف** / 'ekteŝāf، ــها؛ ــات/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی دۆزینەوە؛ یۆسەیوە؛ ڤەدیتن؛ ئاگەدار بوون لە دیاردەیەک کە پێشتر هەبووە و پێیان نەزانیوە ‹اکتشاف نفت: دوزینەوەی نەوت›.

**اکتشافات** / 'ekteŝāfāt/: [عربی]/اسم. دۆزیاوەگەل؛ دۆزراوان؛ کۆمەڵە شتانێ کە دۆزراونەتەوە.

**اکتشافی** / 'ekteŝāfî/: [عربی] صفت. ۱. دۆزراوە؛ دۆزیاگەوە؛ پەیدابووگ ‹اموال اکتشافی: ماڵی دوزراوە› ۲. دۆزینەوەیی؛ دۆزیاگی؛ دۆزراوەیی؛ دۆزیاوەیی؛ ڤەدیتنی؛ ڤەدۆزی؛ سەر بە دۆزینەوە ‹عملیات اکتشافی: کارگەلی دۆزینەوەیی›.

**اکتفا** / 'ektefā/: [عربی]/اسم. بەسەندەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەس بوون.

▣ **اکتفا شدن:** بەسەندەکران؛ بەس زانین ‹در اینجا تنها بە ذکر یک مثال اکتفا شد: لێرەدا، تەنیا بە هێنانەوەی وێنەیەک بەسەندە کرا›.

هەروەها: **اکتفا کردن**

**اکثر** / 'aksar/: [عربی] صفت. زۆرتر؛ زێدە تر؛ پتر؛ فرەتر؛ فرەتەر ‹اکثر اوقات: زورتر کات›.

**اکثراً** / 'aksaran/: [عربی] قید. زۆربە؛ زیادتر؛ فرەتر؛ پتر؛ زۆرینە ‹اکثراً بچە بودند: زۆربەیان منداڵ بوون›.

**اکثریت** / 'aksarîyyat/: [عربی]/اسم. پرایی؛ زۆری؛ زۆربە؛ زوربە؛ زۆرمە؛ زۆرم؛ بەشی زۆر؛ پێرایی؛ زۆرینە؛ زووربە؛ زۆراتی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی زۆرتر بوون ‹آنها در جلسه اکثریت داشتند: ئەوان لە دانیشتنەکەدا زۆراتیان هەبوو›. ۲. ئەو بەشەی لە کۆمەڵگا یان دامەزراوە کە ژمارەی ئەندامانی زۆرتر لە بەشەکانی تره ‹اکثریت حزبی: زۆراتی ڕێخراوەیی›.

▣ **از اکثریت انداختن:** لە زۆرینە خستن؛ لە فرەیی خستن؛ لە زۆری خستن: ۱. تەقالای دەستەگەلی کەمینە بۆ بەرگری لە کۆبوونەوەی نوێنەران لە ئەنجومەن و بەرگری لە بەرنامەگەلی دەوڵەت ۲. تەقالای دەستەگەلی کەمینە بۆ بەرەو خۆ کێشانی بڕێ نوێنەرانی زۆرینە یان لابردنیان بە مەبەستی کەم کردنەوەی هۆگرانی دەوڵەت.

**در اکثریت بودن:** لە زۆرینەدا بوون؛ لە فرەییدا بوون؛ لە زۆریدا بوون؛ خاوەنی زۆرترین دەنگ، ئەندام یا لایەنگر بوون.

**اکدی**[1] / 'akadî/: /اسم. ئەکەدی: ۱. هۆزێکی سامی لە دانیشتوانی ناوەندی نێوچۆمان (میزۆپوتامیا) تاکوو دەسپێکردنی هەزارەی دووهەمی پێش زایین ۲. /ـها؛ ـان/ هەریەک لە کەسانی ئەو هۆزە ۳. لە زمانگەلی کەونارای نێوچۆمان لە هەزارەی

سێهەمەوە تا یەکەمی پێش زایین.

**اکدی**[۲]: *صفت.* ئاکدی؛ ئەکێدی؛ پێوەندیدار یان سەر بە وڵاتی لە مێژینەی ئاکێد، لە نێوچۆمان (میزۆپۆتامیا).

**اکراد** / 'akrād/: [عربی] جمعِ ☜ **کُرد**

**اکرام** / 'ekrām، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کاری ڕێز لێنان؛ ڕێزگرتن؛ ڕێز نان و دڵۆڤانی کردن.

**اکران** / 'ekrān/: [فرانسوی]/اسم. پەردەی سینەما؛ سەکۆی شانۆ.

▣ **روی اکران آمدن:** پیشاندان؛ بڵاو کردنەوەی فیلم؛ نیشاندانی فیلم.

**اکراه** /ekrāh/: [عربی]/اسم. ۱. نابەدڵی؛ بێ مەیلی؛ ناحەزی؛ بێز ‹با اکراه قبول کرد: بە نابەدڵی وەری گرت› ۲. وەڕەزی؛ وەڕسی؛ بێزاری؛ وەڕەزی؛ وێڕسی ‹اکراه او مشخص بود: وەڕەزیەکەی دیار بوو›.

▣ **اکراه داشتن:** ۱. پێ ناخۆش بوون ۲. وەڕس بوون؛ بێزار بوون؛ نەڤیان.

**اکردوکر** / 'akerdoker/: [؟]/اسم. شەشخان؛ شەخشان؛ قزیان_قزیان؛ خەستە_خەستە؛ خەتبازی؛ جۆرێ گەمەی منداڵانەی دوو یا چەند کەسییە کە بە سەر زەویدا خێڵگەلێک دەکێشن و یەکە بە یەکە _ لەسەر لاقێک_ بە ناو خانووەکاندا باز دەدەن. **لی_لی**

**اکره** / 'akare/: [عربی]/اسم. ۱. *[نامتداول]* وەرزێر؛ بێوەرز؛ فەلا؛ کاریگەری کشت و کاڵ ۲. *[مجازی]* دەسە و دایەرە؛ دەس و پەیوەند.

**اکسیر** / 'eksîr، ـها/: [معرب از یونانی]/اسم. ئێکسیر: ۱. *[قدیمی]* گەوهەرێ کە وێدەچوو چییەتی شتەکان دەگۆڕی و تەواوتریان دەکا (وەک جیوە بکاتە زیو، مس بکاتە زێڕ) ۲. *[کنایی]* هەرشتێ کە دەست نەکەوێ یان سەخڵەت دەسکەوێ.

**اکسیژن** / 'oksîjen/: [فرانسوی]/اسم. ئۆکسیژن؛ توخمی کیمیاوی بە ژمارەی ئەتومی ۸ و کێشی ئەتومی ۱٥،۹۹، گازی شکڵ، ۲۱٪ ی بارستایی کەشە، بێ ڕەنگ و بۆن و تامە و قورستر لە هەوا، لە تێکەڵی لەگەڵ هیدرۆژندا پێکهێنەری ئاوە.

**اکسیژندار** / 'oksîjendār، ـها/: [فرانسوی/ فارسی.] *صفت.* بە ئۆکسیژن؛ ئۆکسیژندار.

**اکسیژنه** / 'oksîjene/: [فرانسوی] *صفت.* ئۆکسیژندار.

**اکسیور** / 'oksiyor، ـها/: [؟]/اسم. ☜ **کرمک _۲**

**اکشن**[۱] / 'akšen/: [انگلیسی]/اسم. *[سینما]* لێدە و بەردە؛ تێک هەڵپڕژاوی (لە فیلمدا).

**اکشن**[۲]: *صفت.* *[سینما]* پڕشەڕ و شۆڕ (لە فیلمدا).

**اکلیل** / 'eklîl/: [عربی]/اسم. ۱. / ـها/ *[ادبی]* تاج ۲. / ـها/ *[گیاەشناسی]* کولیلک؛ تاجە گوڵینە ۳. ئەکلیل؛ گەردێکی بریقەدارە وەک زێڕ و زیو دەنوێنێ و بۆ نەخشاندن و جوانکاری دەبێ ٤. / ـها/ *[نجوم]* کەلوو؛ ناوی دوو ئەستێرەی ئاسمانیە.

▣ **اکلیل جنوبی:** کەلووی باشووری.

**اکلیل شمالی:** کەلووی باکووری.

**اکلیل کوهی:** گەلاپەژم؛ گیواوە نانەشان؛ بنەگیاییێکی گەلاوردیلەی بۆنخۆشە.

**اکلیل کاری** / 'eklîlkārî/: [عربی/ فارسی] /اسم. ناواندن؛ هەڵناوین (بە ئەکلیل).

**اکلیلی** / 'eklîlî/: [عربی] *صفت.* ۱. ئەکلیلی؛ ئەکلیلی ڕەنگ ۲. تاج ئاسا؛ تاجی.

**اکمل** / 'akmal/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* تەواوتر؛ بالاتر؛ تەمامتەر.

**اکناف** / 'aknāf/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* سووچ و قوژبن؛ کون و قوژبن؛ کونج و کەنار؛ ڕۆخ؛ لێوار؛ ئەملا و ئەولا؛ کەراخ بێچاخێ.

**اکنـــون**[1] / aknûn' /: اســم. [ادبــی] ئێــستا؛ ئێــستاکە؛ ئێــستە؛ ئــەمێــستا؛ ئــەمێــستە؛ ئــەوێــستا؛ وێــسە؛ ویــستا؛ وێــستا؛ ئیــستێ؛ ئیــسە؛ ئێــستێکانی؛ ئێــستەکــێ؛ ئایــسە؛ هەیسە؛ نها؛ نوها؛ نهۆ؛ نوهۆ؛ نهـە؛ نـەهـە؛ نـوە؛ نۆکە؛ نۆکا؛ نەوکـە؛ نـەکـای؛ هـەوکـە؛ هـەنـوو؛ هـەنواکـە؛ هـەنووکـە؛ نـارا؛ کـانی؛ ئـەنـا؛ هـا؛ ئەوەتا؛ ئەم دەمـە؛ هێـستا؛ هـەنواکانـە؛ ئێمکـێ؛ ئێمکە؛ کات و سـاتێ کـە تێیـداین ‹اکنـون وقـت کار است: ئێستا کاتی کارە›.

**اکنـون**[2]: قیـد. ئێـستاکە؛ ئێـستا؛ ئیـسە؛ نهـا؛ ئـەوکـات و سـاتەی هـاین تێیـدا ‹اکنـون بـاد می‌آید؛ اکنـون مـی‌شـنوم: ئێـستاکە بـا دێـت؛ ئێـستا دەبیبیسم›.

**اکــو** / eko' /: [فرانــسوی] اســم. دەنگدانـــەوە؛ زایەڵە؛ پێژن؛ ئەوا دەنگ؛ دەنگڤەدان.

**اکوسیـــستم** / ekosîstem' ، ـــهـــا /: [فرانـــسوی] اســم. [زیــستشناســی] دەژەوار؛ کۆمـــەڵـــی گیانـداران و ژینگـەی سروشـتیان (وەک گـۆم، لێڕ، چۆلگە).

**اکــول** / akûl' ، ـهـا /: [عربـی] صـفت. [ادبـی] زۆرخـۆر؛ سـکەڕۆ؛ گـرگن؛ زگـدڕاو؛ فـرەخـوەر؛ فرەوەر؛ زێدەخـۆر؛ کەسـێ کـە زۆر حـەزی لـە خواردنە و زیاتر لە ڕادەی ئاسایی دەخوا.

**اکـــولژی** / ekolozî' /: [فرانـــسوی] اســـم. دەژەوارناسی؛ ژینگەناسی.

**اکولژیـست** / ekolojîst' ، ـهـا /: [فرانسوی] اسم. دەژەوارناس؛ ژینگەناس.

**اکـــولژیکی** / ekolojîkî' /: [فرانـــسوی] صـــفت. دەژەوارگەیی.

**اکونـــومی** / ekonomî' /: [فرانـــسوی] اســـم. ئابووری.

**اکونومیـست** / ekonomîst' ، ـهـا /: [فرانـسوی] اسم. ئـابووریزان؛ ئـابووریناس؛ شـارەزای زانستی ئابووری.

**اکونومیـــک** / ekonomîk' /: [فرانـــسوی] صـفت. ئابووریانە.

**اکیپ** / ekîp' ، ـهـا /: [فرانسوی] اسم. ریـز؛ پێـڕ؛ تـاقم؛ کۆمـەڵ؛ گـرووپ؛ دەسـتە؛ پـۆل؛ گـۆل؛ پەڵـە؛ چـین ‹گفتنـد: تـو بـە اکیـپ مـا نمـی‌خـوری، بهتـر اسـت بـروی: گوتیـان: تـۆ بـە ریـزی ئێمـە ناخۆی، باشترە بڕۆی›.

**اکید** / akîd' /: [عربـی] صـفت. چـڕ؛ ئەکیـد؛ پـێ لەسەر داگیراو ‹دستور اکید: فرمانی چڕ›.

**اکیـــداً** / akîdan' /: [عربـــی] قیـــد. چـــڕ و پـــڕ؛ بـــەپێـــداگری؛ ب مـــسۆگەری ‹اکیـــداً توصـیه می‌شود: بە چڕ و پڕی ڕادەسپێردرێت›.

**اگــر** / agar' ، ـــهـــا /: حـرف. ئـەگـەر؛ هـەگـەر؛ ئەیەر: ۱. پیتی مـەرج؛ هـەکـە؛ ئـەگـە؛ هـەک؛ هەگە؛ هەکوو؛ سـەخمـەراتی؛ کـە؛ هـاتوو؛ ئـەر؛ ئەگەرکوو؛ گـە؛ گـەر؛ گـەردا؛ گـەردانـە؛ بێتـوو؛ وەگی؛ هـەر؛ ئـەگ ‹اگـر بیـایی مـی‌بینی: ئـەگـەر بێـی، دەبـینی› ۲. ڕەنگـە؛ ڕەنگـا؛ گاهـەز ‹هـزار جور حرف می‌زند، اگـر یکـی معنـی و سـر و تـە داشـتە باشد: هەزار جۆر قسە دەکا، ئـەگـەر یـەکیـان واتـا و سـەر و بـنی هـەبـێ› ۳. ئـەر؛ پـیتی نـەکـردن: الف) لە سـوێنددا دێ ‹خـدا مـرا بکـشد اگـر همچـو حرفی گفتە باشم: خوا بمکـوژێ ئـەر ئـاوا قـسە یـێکم گوتبــێ› ب) لـــە وریـــا کردنـــەوەدا دێ ‹اگـــر نریختـی! اگـر نرفـت!: ئـەگـەر نـەتڕژانـد! ئـەگـەر نـەچـوو!› (یـانی دەیـڕژنی، دەچـێ) ج) لـــە پێداگریـدا دێ ‹اگـر بکـشی هـم از جـایم تکـان نمـی‌خـورم: ئـەگـەر بیـشمکوژی لـە جێـی خـۆم نـابزووم› د) لـە پرسـیاردا دێ ‹اگـر گفتـی تـوی دسـتم چـە دارم ؟: ئـەگـەر گوتـت چـی لـە نـاو دەسـتمدایـە؟› (واتـا: نـازانی بێـژی) ٤. خۆزگـە؛ بریـا؛ وەشـڵەی ‹اگـر مـی‌شـد او را ببینی!: ئـەگـەر دەتدی!› ( یانێ: بریا چاوت پێ دەکەوت).

◘ **اگر آوردن** ☜ **اگر و مگر کردن**

**اگر و مگر کردن:** منجـەمـنج کـردن؛ ئـەگـەر

و مەگەرکردن؛ منەمن کردن؛ ئەریٚ و نەریٚ کردن؛ منگەمنگ کردن؛ ئەگەر تیٚ‌هیٚنان: **اگر آوردن**

**اگرچه** / agarče'/: حرف. ئەگەرچی؛ لەوماکوو؛ هەرچن؛ هەرچەندە؛ هەرچننە؛ هەرچەن؛ پیتی مەرج بۆ ڕستەییٚک کە دوو ئاوەڵناو، کردار یا خۆ ئاوەڵکرداری دژی هەبیٚ ‹اگرچه دیر رسیدم، درس هنوز آغاز نشده بود: ئەگەرچی درەنگ گەییشتم، دەرسەکە هیٚشتا دەستی پیٚ‌نەکردبوو›.

**اگزما** / egzemā'/: [فرانسوی]/اسم. گزنەک؛ گەزنەک؛ بیرۆی تەڕ؛ سەودا؛ خۆلیا؛ تەرە و بیرۆ؛ بیرۆڤ؛ جۆریٚ نەخۆشی خارشتی و ناگیرۆی پیٚستە کە بە هۆگەلی نادیارەوە پەیدا دەبیٚ.

**اگزوفتالمی** / egzoftālmî'/: [؟]/اسم. *[پزشکی]* بۆقی؛ پۆقی؛ دەرپەڕیوی گۆی چاو.

**اگزیستانسیالیست** / egzîstānsiyālîst'، ـها/: [فرانسوی] صفت. ئیگزیستانسیالیست؛ پەیڕەو یان هۆگری ئیگزیستانسیالیسم.

**اگزیستانسیالیسم** / egzîstānsiyālîsm'/: [فرانسوی] *صفت.* ئیگزیستانسیالیسم؛ لە مەکتەبە ناودارەکانی چەرخی بیستەم لە ڕۆژئاوادا کە بڕوای لە سەر ئەوەیە مرۆ بۆ خۆی چۆناوچۆنی ژیان و هەڵس‌وکەوتی ژین دەنەخشیٚنیٚ.

**اگو** / ego'/: [فرانسوی]/اسم. ۱. کناراو؛ ئەیاخ؛ تۆڕی کناراو ۲. *[روان‌شناسی]* ئەز؛ من؛ خۆ؛ ویٚ.

**الا** / alā'/: [عربی] *صوت. [ادبی]* ئەریٚ؛ هەریٚ؛ هۆ؛ ئەریٚ‌هۆ؛ ئەهەی؛ ئەرە؛ ئانە؛ وشەی بانگ کردن و سەرنج ڕاکیٚشان ‹الا ای آهوی وحشی کجایی؟: ئەریٚ هۆ ئاسکی باسکان کوا لەکویٚدای؟›.

**الا** / ellā'/: [عربی] حرف. بیٚجگە؛ جگە؛ جگەم؛ بیٚجگەم؛ مەگەر ‹هر وقت خواستی بیا، الا امروز: هەرکاتیٚ پیٚت خۆشە وەرە، بیٚجگە ئیمڕۆ›.

**الابختکی** / allābaxtakî'/: [از عربی/فارسی] ☜ **الله‌بَختی**

**الابختی** / allābaxtî'/: [از عربی/فارسی] ☜ **الله‌بَختی**

**الاستیسیته** / elāstîsîte'/: [فرانسوی] ☜ **کشسانی**

**الاستیک** / elāstîk'، ـها/: [فرانسوی] ☜ **کشسانی**

**الاغ** / olāq'، ـها/: [ترکی]/اسم. کەر؛ هەر؛ کەمشۆ؛ گۆ هەریٚژ؛ گویٚریٚژ؛ ولاخ؛ گویٚ دریٚژ؛ ئولاخ؛ حەقز.

**الاغبان** / olāqbān'، ـها؛ ـان/: [ترکی/فارسی] کەرلەوەڕیٚن؛ کەرەوان؛ شوانی کەران.

**الاغ‌دار** / olāqdār'، ـها/: [ترکی/فارسی] ناویژ؛ خەربەندە؛ کەردار؛ کەریار؛ ولاغار.

**الاکلنگ** / allākolang'/: [؟]/اسم. حندرحۆ؛ حەندەرحۆ؛ سیسۆ؛ جیٚجلقانە؛ حیٚجلقانە؛ ئەم‌سەرئەوسەر؛ زەرزانیق؛ حەقلی‌مەقۆ؛ حەڵلاقووچکە؛ حەڵلادۆشە؛ حەڵلادۆشکە؛ ئەڵلاجووقە؛ حیٚزەرقانە؛ حەلەق‌مەلەق؛ هەلەق‌مەلەق؛ داردوولەق؛ هەلەقوٚم.

**الامان** / al'amān'/: [عربی] *صوت.* ئەی هاوار؛ ئامان؛ هاوار؛ هانا؛ وشەییٚک بۆ یارمەتی خوازی لە هەمبەر زۆر و ئازارەوە ‹الامان به دادم برسید: نەی هاوار فریام کەون›.

**الاملیک** / alāmelîk'/: [؟] ☜ **فاشِرا**

**الآن**[1] / al'ān'/: [عربی]/اسم. ئیٚستا؛ ئیسە؛ ئیٚستاکە؛ هەنووکە؛ ئەوجا؛ نها؛ نوها؛ ئەم‌کاتە کە تیٚیداین ‹الآن وقت این کار نیست: ئیٚستا بۆ ئەم کارە نابیٚ›.

**الآن**[2]: *قید.* هەرئیٚستا؛ هەر ئیسە؛ ئیٚستاکە؛ ئائیٚستا؛ نانک؛ ئیسە؛ نهۆ؛ نووکە؛ ناکا؛

هەنووکە ‹الآن می‌آیم: هەر ئێستا دێم›.

**الاوبـــــلا** / 'ellā-vo-bellā/: [عربـــی] *قیـــد. [گفتـاری]* هـەر؛ حـەر؛ ئـیللا و بـیللا؛ ئـیللان و بیللان؛ وشەیەکە بـۆ پێداگری دەگـوترێ ‹الا و بلا باید بیایی: هەر دەبێ بێی›: **الاوبالله**

**الاوبالله** / 'ellā-vo-bellāh/: [عربی] ☜ **اَلّاوبِلّا**

**الاه** / 'elāh/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* خـوا؛ خـودا؛ خـودێ؛ خوالـە؛ یـەزدان؛ خـواوەن؛ خـواوەنـد؛ ئافرێنەر: **إله**

**الاهـه** / 'elāhe، ـهـا؛ ـگـان/: [عربـی] *اسـم.* خـوا؛ نـاوی خـوای مێوینـە لـە ئایینـەکـانی چـەندپـەرستیدا ‹ونـوس، الهـەی عشق و زیبـایی بود: ونووس، خوای ئەڤین و جوانی بوو›: **إلهه**

**الاهـــی** / 'elāhî/: [عربـــی] *صـفت.* خـوایی؛ پێـوەندیـدار بـە خـواوە ‹قـدرت الاهـی: هێـزی خوایی›: **إلهی**

**الاهــی** / 'elā:hî/: [عربـی] *دعـا.* خوایـە؛ خوایـا: ۱. خـواوەنـد ‹الاهـی شـکر: خوایـە شـوکر› ۲. یـاخوا؛ خـوا بکـا؛ لـە خـوام گـەرەک؛ خواکـەرۆ ‹الاهی همەشـان سالم برگردنـد: یـاخوا هـەموویـان ساغ بگەڕنەوە›.

**الاهیـــــات** / 'elāhîyyāt/: [عربـــی] *اســـم.* خواناسـی؛ زانـستی خواناسـی: ۱. زانیـاری لـەمـەڕخوا و چۆنیـەتی ئـەووە ۲. زانیاریگـەلی پێوەندیدار بە ئـامۆژەکـانی ئـایین یـان دینێکـی تایبـەت لـە بـارەی خـواوە *خداشناســی؛ یزدان‌شناخت؛ **الهیات**

**الاهیـــــون** / 'elāhîyyûn/: [عربـــی] *اســـم.* خواناسان؛ خواناسێ: **الهیّون**

**الئـین** / 'ole'în/: [؟] *اسـم. [شـیمی]* ئـولێئین؛ ماکێکی چـەور، بـێ‌ڕەنـگ و ناتێکـەڵ لـە ئـاودا کـە لـە ڕۆن زەیتـوون و زۆرێـک لـە ڕۆنگـەل بەدی دێت.

**البـاقی** / 'albāqî/: [عربـی] *اسـم.* پاشمـاوە؛ باقی؛ پاشڤەمانی.

**البتـه** / 'albatte/: [عربـی] *قیـد.* هـەڵـبەت؛ بـێ‌گومـان؛ بـێ‌سـۆ؛ هـەڵـبەتـە؛ ئـەڵـبەت؛ هـەبـەت؛ نیـشانەی دووپاتـەیـی: *الـف)* واتـە؛ هـەروایـە؛ وەهایـە؛ هـەر پاسـەن؛ پاسـەنـە؛ بەڕاستی؛ ڕاسـەکـەی ‹البتـه، ایـن را هـم فرامـوش نکنیـد کـە...: هـەڵـبەت، ئـەمـەش لـەبیر مـەکـەن کە...› *ب)* بەڵـێ ‹پرسید: منتظر مـی‌مـانی؟ گفتم: البته: پرسی: چاوەڕوان دەبی؟ وتم: بێ‌گومان›.

**البـسه** / 'albase, 'albese/: [عربـی] ☜ جمـعِ **لِباس**

**الپـــر** / 'alpar، ـهـا/: *صـفت. [گفتـاری]* ۱. زمـانلـووس؛ زمانبـاز ۲. سـەگفـزوول؛ چـەتـوون؛ چـەتلـەمـەر؛ فێـڵزان؛ وشـیاری بەئازار.

**التبـاس** / 'eltebās/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* شـێوانکاری؛ بـە هـەڵـەبـەری؛ کـار یـان ڕەوتی گۆڕانـدنی ڕواڵـەتی شـتێ یـا کارێـک بـۆ خەڵەتاندن یا تووشی هەڵە کردنی خەڵک.

**التجـا** / 'eltecā، ـهـا؛ ـات/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* پەنابەری؛ هانـا بـەردەی؛ کـار یـان ڕەوتی پـەنـا بردنە کەسێ یان جێگایەک.

▣ **التجا آوردن:** پەنا هێنان؛ داڵدە هێنان.

**التـذاذ** / 'eltezāz/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* ڕەوتی لـەزەت بـردن؛ چێژگـرتن؛ تـام بـردن؛ حـەزی لێبردن و خۆشی لێچەشتن.

**التـــزام** / 'eltezām/: [عربـــی] *اســـم.* ۱. هاوڕێیـەتی ۲. پابـەنـدی؛ دەربـەسـتی ‹التـزام عملی: پابەندی کردەیانە›.

▣ **التزام دادن:** بـەڵـێن‌دان؛ لـە ئـەسـتۆگرتن؛ وەخۆگرتن؛ بەڵێن دان بـۆ جێبـەجـێ کـردنی کارێک. هەروەها: **التزام گرفتن**

**در التـــزام رکـــاب بـــودن:** لـــە خزمـــەت گەورەییکدا بۆ شوێنێک چوون.

**التزامـــــی** / 'eltezāmî/: [عربـــی] *صـــفت.* هاوڕێیی؛ دەربەستەکی.

**التصاق** / eltesāq'/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* ۱. *[نامتداول]* پێکەوەیی؛ پێوەستەیی ۲. نووساوی؛ چەسپاوی؛ لکاوی.

**التفات** / eltefāt'، ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* ۱. لاوە؛ هاقڕ؛ کار و ڕەوتی لاکردنەوە؛ ئاوڕ دانەوە ‹ایشان مدتی است بە ما التفات ندارند: بەڕێزیان ماوەیەکە لا لە ئێمە ناکەنەوە› ۲. *[کنایی]* چاکە دەگەڵ کردن ۳. بەخشش ‹ایشان ۱۰۰۰ تومان التفات فرمودند: بەڕێزیان ۱۰۰۰ تمەن بەخشفتیان فەرموو›.

**التفاتی** / eltefātî'/: [عربی] *صفت.* دراو؛ دریاگ؛ بەخشێنراو؛ مەرحەمەت کراو؛ مەرحەمەتی.

**التقاط** / elteqāt'، ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم.* کار یان ڕەوتی هەڵگرتنەوە؛ بە دەس هێنانی شتگەلێک لە جێگەگەلێکی جۆراوجۆر و کۆ کردنەوەیان لە شوێنێک (وەک ئامۆژەکانی ئایینی یان فەلسەفی).

**التقاطی** / elteqātî'/: [عربی] *صفت.* لێک هەڵگرتە.

**التماس** / eltemās'، ـها/: [عربی]/*اسم.* لاقەکی؛ هەوەر؛ سکاڵە؛ سکالا؛ لالسکە؛ لالک؛ لالکە؛ لالانەوە؛ لالیانەوە؛ لالە؛ نزوولە؛ دەخیل؛ قولەفسی؛ پاڕانەوە؛ ئەوەلالیەی؛ خوایشتی پێداگریانە و خاکەسارانە.

⊡ **التماس دعا:** داوای دوعای خەیر کردن؛ هیڤیا خێرێ کرن.

**عجز و التماس:** گریان و پاڕانەوە؛ نک و لالە؛ تکا و نزا؛ تکا و لالە؛ لالکیان.

⊡ **التماس کردن:** پاڕانەوە؛ لاقەکردن؛ لالانەوە؛ لالیانەوە؛ ئەوەلالیەی.

**التماس و پناه خواستن:** دامێن گرتن؛ بریتی لە پەنا بۆ بردن و تکا کردن لە کەسێ.

**التهاب** / eltehāb'/: [عربی]/*اسم.* ۱. هەڵتۆقیوی؛ هەڵماسیوی ۲. ـها؛ ـات/ کزانەوە؛ چووزانەوە؛ گرۆ؛ گرۆن؛ وەرمتن؛ سووتانەوە و هەوکردنی پێست.

**التیام** / eltiyām'/: [عربی]/*اسم.* سۆ؛ سارێژ؛ سارێش؛ قەموش؛ خوز هێنانەوە؛ ڤەکەویان؛ کار یان ڕەوتی خۆش بوونەوەی برین.

⊡ **التیام بخشیدن:** سارێژکردن؛ دەرمان کردن؛ چاکردنەوە؛ چارەکردن؛ خۆشەو کردنەوە؛ خوەشەوکردن.

**التیام پذیرفتن** ☜ **التیام یافتن**

**التیام یافتن:** سارێژ بوون؛ قەمووشک گرتن؛ خوەشەو بوون؛ خۆش بوونەوە؛ خۆشەو بوونەوە؛ پڕ بوونەوەی برین و چا بوونەوەی ‹پس از دو ماه زخمایش التیام یافت: دوای دوو مانگ زامەکانی خوش بوونەوە›: **التیام پذیرفتن**

**التیامپذیر** / eltiyāmpazîr'/: [عربی/ فارسی] *صفت.* چاکەوەبوو؛ وەشەو بیە ‹گمان می‌کردم این درد دیگر التیامپذیر نیست: وامدەزانی ئەم دەردە ئیتر چاکەوەبوونی بۆ نیە›.

**التیماتوم** / oltîmātom'، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* دواهای؛ دوایین هەڕەشە؛ دوا وشیاری؛ داخوازی یان دوایین هۆشیاری (زۆرتر) لەگەڵ هەڕەشەدا بە دیاریکردنی ماوە بۆ وەرامدانەوە: **اُولتیماتوم**

**الحاح** / elhāh'/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* کار و ڕەوتی پاڕانەوە؛ لالانەوە؛ تکا کردن؛ پێکۆڵی بە کوڵ و گریان.

**الحاد** / elhād'/: [عربی]/*اسم.* ۱. بێدینی؛ بێبڕوایی؛ بێباوەڕی؛ بێباوەڕی بە بوونی خوا و پێغەمبەر ۲. *[مجازی]* هەڵگەڕانەوە لە دین؛ دەس لە بڕوا بەردان؛ لاڕێیی.

**الحادی** / elhādî'/: [عربی] *صفت.* بێدینی؛ بێباوەڕی؛ ناباوەڕی؛ بێبڕوایی.

**الحاصل** / alhāsel'/: [عربی] حرف. له ئاكامدا؛ له ئه نجامدا؛ عه لاكوللی؛ وه لحاسڵ؛ به رهه مى كار (یان وت و ویژ)؛ ئه وه كه ‹الحاصل، هیچ نتیجه‌ای حاصل نشد: له ئاكامدا، هیچ ئه‌نجامێكی لێنه‌كه‌وته‌وه›.

**الحاق** / elhāq'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. په یوه ست؛ پێوه ست؛ هه ڤبه ند؛ كار یان ڕه وتی پێبه‌ستن؛ لكاندن.

⊡ **الحاق شدن**: پێوه‌لكان؛ پێوه به‌ستران.

**الحاق كردن**: پێوه لكاندن؛ پێوه به‌ستن؛ پێوه لكه‌ده‌ی.

**الحاقی** / elhāqî'/: [عربی] صفت. پێبه‌ستراو؛ به‌ستراوه؛ پێلكاو؛ پاشكۆیی.

**الحان** / alhān'/: [عربی]/اسم. /ادبی/ سۆز و چره؛ ده‌نگی خۆش ‹الحان بلبلان: سۆز و چره‌ی بولبولان›.

**الحذر** / alhazar'/: [عربی] صوت. وریا به؛ وشیار به؛ هاگات بۆ؛ به واتای نه‌كه‌ی، دوور به؛ وشه‌یه‌ك بۆ ئاگه‌داركردنه‌وه و پرینگاندنه‌وه.

**الحق** / alhaq'/: [عربی] قید. به ڕاستی ‹الحق آدم درستی است: به‌ڕاستی مرۆڤێكی دروسته›.

**الحمد** / alhamd'/: [عربی]/اسم. سووره‌ی حه‌مد؛ فاتیحا.

⊡ **الحمد كسی را خواندن**: /كنایی/؛ فاتحای كه‌سێ خوێندن؛ به مردوو دانانی كه‌سێ

**الحمدلله** / alhamdolellāh'/: [عربی] دعا. شوكر بۆ خوا؛ خوایا شوكر؛ (له) سایه‌ی خواوه؛ سپاس بۆ خوا؛ ئه‌لحه‌مدولیلا.

**الخ** / elax'/: [عربی] قید. /مخفف/ هتد؛ تا كۆتایی؛ هه‌تا دوایی؛ تا دمایی.

**الدرم‌ بلدرم** / oldoromboldorom'/: [تركی] اسم. /گفتاری/ هه‌ڕه‌شه و گوڕه‌شه؛ وشكه هه‌ڕه‌شه؛ پفه گوڕه‌شه؛ باگوڕه. هه‌روه‌ها: **الدرم‌ بلدرم كردن**

**الدنگ** / aldang'، ـها/: صفت. /گفتاری/ خوێڕی؛ بێكاره؛ به‌ره‌ڵلا و بێ‌كه‌ڵك؛ وێڵه كی؛ كولانی ‹بیچاره زن مجبور است كلفتی بكند و بدهد شوهر الدنگش بخورد: ژنی داماو ده‌بێ كلفه‌تی بكا و بیدا به شووه خوێڕیه‌كه‌ی بیخوا›.

**الرد** / alrad'/: اسم. ڕه‌شكه؛ تۆڕی گه‌وچن بۆ كاكێشان و...

**الزام** / elzām'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. پێویستی؛ پێویست بوونی؛ هه‌ڤبه‌ندی ‹الزامی نبود كه از گوینده نامی به میان آید: پێویستیه‌ك نه‌بوو ناوی بێژه‌ر بێته گۆڕێ›.

**الزاماً** / elzāman'/: [عربی] قید. چاری ناچار؛ پێویستی؛ به پێویست ‹شركت در یک جلسه‌ی سخنرانی الزاما به معنی پذیرش عقیده ی سخنران نیست: به‌شداری له كۆڕێكی وتاربێژیدا مانای به پێویست بوونی قه‌بوولی قسه‌ی بێژه‌ر نیه›.

**الزام‌آور** / elzāmāvar'/: [عربی/ فارسی] صفت. ده‌ربه‌ستی‌هێنه‌ر ‹این جانب از امضای هرگونه سند الزام‌آور معذورم: ئه‌ز هیچ جۆره به‌لگه‌یه‌كی ده‌ربه‌ستی‌هێنه‌ر ئیمزا ناكه‌م›.

**الزامی** / elzāmî'/: [عربی] صفت. ناچاری؛ پێویست؛ زۆری؛ زۆره‌كی؛ خورتی ‹همراه داشتن گذرنامه هنگام سفر به خارج الزامی است: هه‌بوونی ڕێگه‌نامه له كاتی سه‌فه‌ر بۆ ده‌ره‌وه‌دا پێویسته›.

**الساعه** / assā'e'/: [عربی] قید. هه‌ر ئێستا؛ ئێستاكه؛ هه‌ر ئیسه؛ هه‌ر ئایسه؛ ئاییسه؛ ئه‌م ساته ‹الساعه می‌آیم: هه‌ر ئیستا دێم›.

**الست** / alast'/: [عربی]/اسم. /ادبی/ سه‌ره‌تا؛ سه‌ره‌تای به‌دی هاتنی جیهان.

**السنه** / alsene'/: [عربی]/اسم. /ادبی/ زمانان؛ زمانه‌كان؛ زمانگه‌ل؛ زوانێ ‹السنه‌ی خارجی: زمانانی بیانی›.

**الصاق** / elsāq'/: [عربی]/اسم. كار یان ڕه‌وتی

لکانـدن؛ چـەسـپاندن؛ دالکانـدن ‹الـصاق عکس به شناسنامە: چەسپاندنی وێنە بە پێناسەوە›.

▣ **الـصاق شـدن:** لکـان؛ لکێنـران؛ زانـق کەردەی؛ نویسیان.

**الـصاق کـردن:** نووسـتانن؛ نووسـاندن؛ لکانـدن؛ لکنـەی؛ ئـەوە لکنـەی؛ پێـڤە نویساندن.

**الـصاقی** / elsāqî'/: [عربـی] *صـفت*. نووسـاوە؛ لکاو؛ لکێنراو؛ زانق کریا؛ نویسیایی.

**الطاف** / altāf'/: [عربی] جمعِ ☜ **لُطف**

**العطـش** / al'ataš'/: [عربـی] *صـوت*. هـاوار لـە تینوویەتی؛ ناڵین و هاوار لەبەر تینوویەتی.

**العیاذبـالله** / al'ayāzobellāh'/: [عربـی] ☜ **عیاذُبِالله**

**الغـا** / elqā'/: [عربـی] *اسـم*. هـەڵـوەشـاندنەوە؛ ڕەش کردنەوە؛ پووچەڵ کردنەوە؛ شێواندنەوە.

▣ **الغا شدن:** هـەڵـوەشـێنران؛ هـەڵـوەشـان؛ بـەتاڵـەوە بـوون ‹قـرارداد نفـت الغـا شـد: بڕیارنامەی نەوتەکە هـەڵـوەشـێنرا›. هـەروەهـا: **الغا کردن**

**الغـاگری** / elqāgary'/: [عربـی/ فارسـی] *اسـم*. هەڵـوەشـێنەری؛ پووچـەڵـکەری؛ بـەتاڵـگەری؛ پێـز و بنـەمـای پێـوەندیـدار بـە هەڵوەشـاندنەوەی قـانوونی بـەتایبـەت قـانوونی کۆیلەتی. هەروەها: **الغاگر**

**الغرض** / alqaraz'/: [عربی] *حرف*. مـە بـە سـت؛ لـە ئـەنجامـدا؛ کـورت‌وبڕ؛ مـزار؛ خولاسـە؛ بـە کورتی؛ بەکورتی و کوردی.

**الـف** / alef'/: [عربـی] *اسـم*. ئـەلـف: ۱. نـاوی یـەکـەمـین پـیتی ئـەلـف و بێتکـەی زمـانی فارسـی ۲. نمـرەی ئـەلـف؛ بـاشترین نمـرە لـە زانکۆدا.

▣ **یک الف بچه** ☜ **یک**[۲]

▣ **الف از با نـشناختن:** *[کنایی]* کـەر و گـا لێـک جیا نەکردنەوە؛ سـەرە واو بـە زگـا نـەچـوون؛ قل‌وفل لێک جیا نـەکردنـەوە؛ هـەرە لـە بـرە جیا نەکردنەوە؛ نەزان و بێ‌سەواد بوون.

**الـف‌ـــالـف‌کـردن:** قـاش‌ـــقـاش‌کـردن؛ کووز‌ـکووز کەردەی.

**الف بـر خـاک کـشیدن:** *[کنایی]* ئـەسپەردە کـردن؛ بـە خـاک سـپاردن؛ کردنـە ژێـر خاکەوە؛ لە خاک ناشتن؛ ڤەشارتن.

**الـف بـر سـینە کـشیدن:** *[کنـایی]* بـەرۆک دادڕیـن؛ بـەربینـگ شـڕکردن؛ یـەخـە دادڕین.

**الفاظ** / alfāz'/: [عربی] جمعِ ☜ **لَفظ**

**الفبـا** / alefbā'، ـهـا/: [عربی] *اسم*. ئـەلـف‌وبێ؛ ئەلف‌وبێتکە؛ پیتەکانی خوێندن و نووسین.

**الفبائی** / alefbā'î'/: [عربی] ☜ **الفبایی**

**الفبـــایی** / alefbāyî'/: [عربـــی] *صـــفت*. ئـەلـف‌وبێتکـەیـی: ۱. پێـوەندیـدار بـە ئـەلـف‌وبێتکـەوە ‹خـط الفبـایی: نووسـینی ئەلف‌وبێتکەیی› ۲. ڕیزکـراو بـە (پێـی) چنـینی ئـەلـف و بێتکـەوە ‹فهرسـت الفبـایی: پێڕسـتی ئەلف‌وبێتکەیی› ❊ **الفبائی**

**الفـت** / olfat'/: [عربـی] *اسـم*. خۆپێـوەگـری؛ هـۆگری؛ فـێ؛ کـورێ؛ گرابـەسـی. هـەروەهـا: **الفت داشتن؛ الفت یافتن**

▣ **الفـت گـرفتن:** هـۆگر بـوون؛ خـێ‌دان؛ خێ‌پێدان؛ خۆ گرتن؛ خوو گرتن.

**الفـرار** / alfarār'/: [عربـی] *اسـم*. *[گفتـاری]* ئـەوجار هـەڵـێ؛ ڕاکـە؛ دەی بـەرشـە؛ دەرچـۆ بۆی (تێبـینی: لـە فارسـیدا بـە بـێ کـردار لـە نـاو ڕسـتەدا دێ) ‹پولهـا را برداشـت گذاشـت تـوی سـاک و الفرار: پارەکانی هـەڵـگرت و نایـە نـاو سـاکەکـە و ئەوجار هەڵێ›.

**الفمـاری** / alefmārî'/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت*. ئـەلـف‌وبێتکـەیـی؛ بـە ژمـارە یـان زنجـیرەی ئەلف‌وبێتکەییەوە (بە جێ ڕەقەمی).

**القـا** / elqā'، ـهـا؛ ـات/: [عربـی] *اسـم*. نانـە زوان؛

کار یان ڕەوتی ڕەخساندنی بیر و بۆچوونێکی دڵخواز لە کەسێکدا، بە بێ ویست و ئاگەداری ئەو کەسە. هەروەها: **القا شدن؛ القا کردن**

**القائی** / 'elqā'î/: [عربی] ☜ **القایی**

**القائیدگی** / 'elqā'îdegî/: [عربی] ☜ **القاییدگی**

**القاب** / 'alqāb/: [عربی] جمعِ ☜ **لَقَب**

**القصه** / 'alqesse/: [عربی] حرف. بەکورتی؛ ئیتر؛ دواجار؛ کورت و کرمانجی؛ بە کوردی و کورتی؛ ڤەبڕی ‹القصه، من ماندم و یک دست رختخواب: بەکورتی، من مامەوە و جێگەوبانێک›.

**الک** / 'alak، ـها/: اسم. ۱. هێڵەک؛ هێلەک؛ ئێلەک؛ هێڵەگ؛ هێڵەکە؛ ئەلە؛ هێرنگ؛ لەهەڕ؛ غەل؛ غل؛ مووخل؛ ئاردوێژ؛ ئاردبێژ؛ ئاردڤێر؛ ئاردێز؛ قاوێر؛ مۆحڵ؛ دۆبژێن؛ بێژنگی زۆر کون تەنگ کە هاڕدراوی پێ دادەبێژن ۲. هەلووک؛ چێوی درێژی گەمەی هەلووکان.

▣ **الک کردن**: هێڵەک کردن؛ سەڕدانـدن؛ داوێژکردن؛ هەڵواژنن؛ حەس کردن؛ موخلێ کرن.

**الکترا** / 'elekt(e)rā/ ☜ عقدەی الکترا، **عقده**

**الکترواستاتیک** / 'elekt(e)roestātîk، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کارەبای نەبزێو؛ برووسکەی وەستاو؛ ئەو جۆرە لە کارەبا کە وردەوردە لە شتێکدا کۆ دەبێتەوە و بە پێوەدانێک دەردەچێ.

**الکتروتراپی** / 'elekt(e)rot(e)rāpî/: [فرانسوی]/اسم. /پزشکی/ برووسکە دەرمانی.

**الکترون** / 'elekt(e)ron، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ئلیکترۆن؛ لە وردیلەکانی بنەڕەتی توخم.

**الکتریک** / 'elekt(e)rîk, 'elektirîk/: [فرانسوی]/اسم. کارەبا؛ بەرق؛ ئەلەمتریک؛ ئەبلەتریک.

**الکتریکی**[1] / 'elekt(e)rîkî, 'elektirîkî، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ۱. دووکانی فرۆشتن یان دروست کردنەوەی کەرەسەگەلی کارەبایی ۲. بەرقکار؛ کەسێک پیشەی تێک خستنی ئامرازە کارەباییەکانە.

**الکتریکی**[2]: صفت. بەرقی؛ کارەبایی؛ پێوەندیدار بە کارەباوە ‹اسبابهای الکتریکی: کەرەسەگەلی کارەبایی›.

**الک‌دولک** / 'alakdolak/: اسم. هەڵوو؛ هەلووکان؛ هەلووکێن؛ هەلووکانی؛ تراێ؛ ئەلگ مەلگ؛ گەمەیەکی زارۆکانە، بە دارێکی درێژ (هەلووک) لە دارێکی بچووک (دارهەلووک) دەدەن.

**الک‌ساز** / 'alaksaz/: اسم. هێڵەگچی؛ کەسێ کە هێڵەگ چێ دەکا.

**الکل** / 'alkol/: [فرانسوی از عربی]/اسم. ۱. /شیمی/ ئەلکول؛ ناوی گشتی بۆ تاقمیک تراوی کیمیاویە کە ئاور دەگرن و بۆنێکی تایبەتی و تامێکی توندیان هەیە و لە بژیشکی و پیشەسازیدا زۆر بەکار دەچن ۲. خواردنەوەی ئەلکولدار (وەک ویسکی، ودکا، شەراو و...).

**الکل‌سنج** / 'alkolsanc، ـها/: [فرانسوی/فارسی]/اسم. ئەلکول پێو؛ ئامرازی پێوانی ڕادەی ئەلکولی ناو تراوێک.

**الکلومتر** / 'alkolometr، ـها/: [فرانسوی] ☜ **الکل‌سنج**

**الکلی** / 'alkolî/: [فرانسوی] صفت. ئەلکولی: ۱. پێوەندیدار بە ئەلکولەوە ‹تخمیر الکلی: ترشانی ئەلکولی› ۲. تێکەڵ بە ئەلکول ‹نوشابەهای الکلی: خواردنەوەی ئەلکولی› ۳. /ـها/ گیرۆدە بە خواردنەوەی ئەلکول ‹پیرمرد الکلی: پیرەپیاوی ئەلکلولی› ٤. ئەلکولاوی

‹پنبەی الکلی: لۆکەی ئەلکولی›.

◘ **الکلی کردن:** کردنە ئەلکول؛ بە گۆڕانکاری کیمیایی، شتێک کردنە ئەلکول.

**الکلیسم** / 'alkolîsm/: [فرانسوی] *اسم.* ئەلکولیسم؛ گیرۆدەیی بە خواردنەوەگەلی ئەلکولی کە لە شێوازێکی تۆخدا، لەش و بەتایبەت جەرگ تووشی بشێوە و ئاڵۆزی دەکات.

**الکلیک** / 'alkolîk/: [فرانسوی] ☜ **الکلی**

**الکن** / 'alkan/: [عربی] *صفت.* تور؛ تر؛ لاڵەپەتە؛ لاڵەپەترە؛ لالەک؛ تت؛ بڕ؛ زمانگران؛ زوانبەگیر؛ کونزوان؛ دەمبڵ؛ پاڵ؛ زاندە گونایش؛ کەسێ کە لە قسە کردندا زمانی گرێ دەکا.

**الکی**[1] / 'alakî/: [فارسی/ ؟] *صفت. [گفتاری]* لاتەری؛ گۆترە؛ هەروایی: ١. پووچ؛ پووچەڵ؛ بەتاڵ ‹کار الکی: کاری لاتەری› ٢. درۆیین؛ درۆینە؛ بە درۆیی ‹وعدەی الکی: بەڵێنی گۆترە›.

**الکی**[2]: *قید.* لەگۆترە؛ هەروا؛ بە درۆ؛ ئەلەکی ‹الکی می‌گفت، من ریپسم: لە گۆترە دەیگوت، من سەرۆکم›.

**الکی‌خوش** / 'alakîxoš، ـها/: *صفت. [گفتاری]* گۆترەخۆش؛ تووشی خۆشبینی، خۆشحاڵی یان خۆشخەیاڵی پووچەڵ و بێ بنەما.

**الگزیر** / 'elegzîr، ـها/: [فرانسوی از عربی] *اسم. [پزشکی]* شەربەت؛ شەربەتی نەخۆشین.

**الگو** / 'olgû، ـها/: [ترکی] *اسم.* نوێنەک؛ نمێنەک؛ وێنە: ١. گرۆبەر؛ سەرمەشق؛ کەس یان شتێ کە پێوەرە بۆ دیتران ‹او را الگو قرار دادە بود: ئەوی کردبوە نوێنەک بۆ خۆی› ٢. نموونە؛ نموودە؛ نەخشەیەکی پێشنیاری (زۆرتر لە کاغەز، مقەوا یان چێو) بۆ چاولێکردن و لە ڕووی دروستکردن ‹الگوی لباس: نمینەکی جلوبەرگ›.

**الله** / 'allāh/: [عربی] *اسم.* خوا؛ خودا؛ بینایی‌چاوان؛ بینایی‌پاچەهەڤان؛ خودێ؛ خودان؛ خواوەن؛ خواوەند؛ خواڵە؛ خوای تاکە ئافرێنەر (بە پێی ئامۆژەکانی قورئان).

◘ **الله اعلم:** ١. خوا زاناترینە ٢. *[کنایی]* نازانم؛ مەزا؛ خودا دەزانێ و بەس.

**الله اکبر:** خوا گەورەترینە؛ *[کنایی]* بۆ سەرسووڕمان، پشتیوانی یان نەیاری.

◘ **الله‌ـالله کردن/گفتن:** تکاکردن؛ پاڕانەوە؛ دۆعا کردن؛ پەنا بردن بە خوا؛ جە خوای واسەی؛ داوای یارمەتی کردن لە خوا.

**الله‌بختی** / 'allāhbaxtî/: [عربی/ فارسی] *قید. [گفتاری]* خۆ و بەختی؛ بە هەڵکەوت؛ کوت‌وپڕ؛ کتووپڕ؛ خواوڕاسان؛ گز و گومەت؛ بە چەشنی چاوەڕوان نەکراو: **اللّابختی؛ الّابختکی**

**الم** / 'alam، آلام/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ژان؛ تویێ؛ سۆ؛ ئێش؛ ڕەنج؛ ئازار؛ دەرد؛ سوێ؛ سوو؛ چڵ. هەروەها: **الم رسانیدن؛ الم رسیدن؛ الم کشیدن**

**الماس** / 'almās/: [از یونانی] *اسم.* ڕووژە؛ ئەڵماس؛ هەڵماس؛ بەردێکی زۆر سەخت و بە نرخە.

**الماسگون** / 'almāsgûn/: [یونانی/ فارسی] *صفت. [ادبی]* ئەڵماس‌ئاسا؛ ئەڵماس‌وێنە؛ وەکوو ئەڵماس؛ ڕەق، بریقەدار و تیژ وەکوو ئەڵماس.

**الماس‌نشان** / 'almāsnešān/: [یونانی/ فارسی] *صفت.* ئەڵماس‌کار؛ بە ئەڵماس ڕازاوە.

**الماسی**[1] / 'almāsî/: [یونانی] *اسم.* ئەڵماسی؛ ڕەنگی زیوی مەیلەو کەوە.

**الماسی**[2]: *صفت.* ئەڵماسی: ١. وەکوو

ئەڵماس ۲. بە ڕەنگی زێوینی مەیلەو کەوە.

**المان** / 'elemān/: [انگلیسی] ☜ **اِلِمِنت**

**المپیاد** / 'olampiyād، ـها/: [فرانسوی] /اسم. ئولەمپیاد: ۱. ڕێوڕەسمی یاریگەلی وەرزشی جیهانی کە چوار ساڵ جارێ لە وڵاتێکدا بەڕێوە دەچێ ۲. هەرکام لە و کێبەرکێ جیهانیانە کە لە بوارێکی زانستیدا بەڕێوە دەچن.

**المپیک** / 'olampîk/: [فرانسوی] صفت. ئولەمپیک؛ پێوەندیدار بە ئولەمپیادەوە ‹آرم المپیک: درۆشمی ئولەمپیک›.

**المثنی** / 'almosannā/: [عربی] ☜ **رونوشت**

**المرأةالمسلسله** / 'almer'atolmosalsalae/: [عربی] ☜ زن پای در زنجیر، **زن**

**الم‌شنگه** / 'alamšange/: [؟] /اسم. [گفتاری] قیڕقاڕ؛ قا و قیڕ؛ قڕ و قاو؛ قیڕە و هەرەمەزات؛ قڕ و قاڵ؛ قڕ و چیڕەک؛ چەقە؛ قڕە؛ قڕین؛ دەنگ و دۆڕ؛ هەرا‌ـ‌هەرا؛ گوڕە و هەرا؛ چێقە‌ـ‌چێقە؛ گاڵە گاڵ؛ هەرا و هۆریا؛ هۆسە؛ قاوە قاو؛ قیڕەقیڕ؛ زەنا‌ـ‌زەنا؛ چەقە و گوڕە: **عَلَم‌شنگه**

⊡ **الم‌شنگه به پا کردن** ☜ **الم‌شنگه درآوردن**

**الم‌شنگه درآوردن:** قیرقاڕی درۆینە خستنە ڕێ؛ قا و قیژ و هەلاهەلایی بە درۆ دەرهێنان: **الم شنگه به پا کردن؛ الم شنگه راه انداختن؛ الم‌شنگه کردن**

**الم‌شنگه راه انداختن** ☜ **الم‌شنگه در آوردن**

**الم‌شنگه کردن** ☜ **الم‌شنگه در آوردن**

**المنت** / 'element، ـها/: [انگلیسی] /اسم. ئیلیمێنت؛ تەلی گەرمەوکەرە لە ئامرازی کارەباییدا: **اِلمان**

**النگ** / 'alang، ـها/: اسم. مێرووستان؛ شارە مرۆچە؛ شارە مۆرانە؛ هێلانەی مێرووله.

**النگو** / 'alangû، ـها/: [ترکی/ ؟] /اسم. دەسینە؛ بازن؛ بازند؛ بازنک؛ بازنە؛ خرخاڵ؛ خڵخاڵ؛ خڕخڕە؛ گلۆڕ؛ مووچەوانە؛ دەسینک؛ دەزونک؛ دەستەوانەی خشڵێن لە زێڕو زێو کە ژنان لە مەچەکی دەکەن.

**النگ‌ودولنگ** / 'alang-o-dolang، ـها/: اسم. [گفتاری] حەلوو؛ هەڵواسراوەگەلی بێبایەخ.

**النگوگیر** / 'alangûgîr/: [ترکی/ فارسی] /اسم. بەربازن؛ دەستەوانەیێک کە ناهێڵێ بازن هەڵخلیسکێ و خلە‌ـ‌خل بکا.

**النگه** / 'alange/: /اسم. لنگەشەلێ؛ قاچەشەلێ؛ هەنگڵەشەلێ.

**النهایه** / 'annahāye/: [عربی] قید. ئاخری؛ ئاخرەکەی؛ لە ئاکامدا؛ لە کۆتاییدا؛ پانتا؛ لە دیمادا؛ سەرئەنجام ‹النهایه، می بریم می‌فروشیم: ئاخری، دەیبەین دەیفرۆشین›.

**الو** / 'alow, alo: /اسم. [گفتاری] بڵێسە؛ کڵپە؛ بڵێزە؛ گڕ؛ گڕە؛ گوڕ؛ گۆی ئاگری؛ بڵێسەی بەرزی ئاور.

⊡ **الو گرفتن:** گڕگرتن؛ ئاگرگرتن؛ ئەیر گیرتەی: ۱. داگرسان؛ هەڵبوون ۲. [مجازی] ئاور تێبەر بوون؛ زۆر قەڵس بوون؛ زۆر تووڕە بوون.

**الو** / 'alo/: [فرانسوی] صوت. ئەلۆ؛ پەرسڤی تەلەفوونی؛ پێش وتەی تەلەفوون.

**الوا** / 'alwā/: [لاتینی] /اسم. هەزاوا؛ هەزاو؛ ئەزوا؛ تاڵیشاری؛ موڕ؛ عەزوا؛ تاڵشاری؛ دەرمانێکی ڕەش و زۆر تام تاڵە بە عەرەبی «صبر»ی پێ ئێژن.

**الواح** / 'alvāh/: [عربی] ۱. جمعِ ☜ **لَوح** ۲. جمعِ ☜ **لَوحه**

**الوار** / 'alvār، ـها/: /اسم. ئاڵودار؛ لادار؛ ئاڵودار؛ دەپێکی درێژ و پان بڕاوی چوارگۆشە.

▣ **الـــوار ســـقف:** ڕاژە؛ لادار؛ گینـــە؛ مـــاخ؛ دەســـەک؛ دەســـتەک؛ تـــەژە؛ ئـــالۆدار؛ دەستەک؛ تەژە؛ ئالـواری مـیچ؛ داریٚ کـە بـە سەر کاریتەدا ڕادەکێشریٚ.

**الواط** / alvāt'، الـواط/: [بـە قاعـدەی عربـی] *صفت.* ئـەڵـوات؛ خوێـڕی؛ خـۆڕی؛ هـەرزە؛ بـەرەڵـلا؛ شەلاتی؛ هیچەکـە و پووچـەکـە ‹بـا ایـن پسرک الواط نگرد: لەگەڵ ئەو کوڕە خوێڕیە مەگەڕە›.

**الـــواطی** / alvātî'، ـــهـــا/: [از عربـــی] */ســـم.* خوێڕیـەتی؛ خوێریگـەری؛ هـەرزەیـی؛ ئالـواتی ‹کارشـان شـده بـود شـبگردی و الـواطی: کاریـان ببووە شەوگەڕی و خوێریەتی›.

**الـــوان**[1] / alvān'/: [عربـــی]*/ســـم. [ادبـــی]* ڕەنگ‌گـەل؛ ڕەنگـان؛ ڕەنگـیٚ؛ ڕەنگیـەل؛ گۆنـان ‹چراغهـای زیـادی بـا الـوان گونـاگون نورافـشانی مـی‌کردنـد: چرایـەکی زۆر بـە ڕەنـگ‌گەلـی جۆراوجۆرەوە دەترووسکانەوە›.

**الـوان**[2]: *صفت.* ۱. ڕەنگـاوڕەنـگ ‹گلهـای الـوان: گـولانی ڕەنگـاوڕەنـگ› ۲. ڕەنگـین ‹کاغـذ الـوان: کاغەزی ڕەنگین›.

**الـــوداع** / alvedā''/: [عربـــی] *دعـــا. [ادبـــی]* خواحـافیز؛ مـالاوا؛ بـەدۆعـا ‹الـوداع ای روزهـای خـوش جـوانی: خواحـافیز ئـەی ڕۆژانی خۆشـی لاوەتی›.

**الوهیـــت** / ulûhîyyat, 'olohîyyat'/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* خـودایی؛ خـوایی؛ خـواوەنی؛ خواوەندی؛ خوایەتی.

**اله** / elāh'/: [عربی] ☜ **اِلاه**

**الهـام** / elhām'، ـهـا؛ ـات/: [عربی]*/سم.* سـەرۆ؛ گۆوار؛ بیر و هەستێک کـە لـە نادیـارەوە بـە دڵ دەگا.

▣ **الهام شدن:** سەرۆ پێکـران؛ سـەرۆ بـۆ هـاتن؛ گۆوار بوون؛ بە دڵدا هاتن.

**الهام کردن:** سەرۆکردن.

**الهـام گـرفتن:** سـەرۆگرتنـەوە ‹او در نوشـتن آثـارش از طبیعـت الهـام مـی‌گرفـت: لـە نووسـینی ئاســەوارەکانیـــدا لـــە سروشـــت ســـەرۆی دەگرتەوە›.

**الهـــام‌بخـــش** / elhāmbaxš'/: [عربـی/ فارسـی] *صفت.* سەرۆبەخش؛ سەرۆدەر.

**اله وبلـه** / ele-vo-bele'/: [ترکـی] *قیـد. [گفتـاری]* وا و وا؛ ئـاوا و ئـاوا؛ پیـسە و پاسـە؛ چـەنـد و چـوون؛ شـێلە و بێلـە ‹پـشت سـر هـم مـی‌گفـت: الەوبلـە مـی‌کـنم، ایـن را مـی‌خـرم، آن را مـی‌فروشـم: پـەسـای‌پـەس دەیگـوت: وا و وا دەکـەم، ئـەمـە دەکڕم، ئەوە دەفرۆشم›.

**الهه** / elāhe'/: [عربی] ☜ **الاهه**

**الهی** / elāhî'/: [عربی] ☜ **الاهی**

**الهیات** / elāhîyyāt'/: [عربی] ☜ **الاهیّات**

**الهیون** / elāhîyyûn'/: [عربی] ☜ **الاهیّون**

**الـی** / elā'/: [عربـی] *حـرف.* تـا؛ هـەتـا؛ تـاکوو؛ هەتاوەکوو ‹الی آخر: تا ئاخر›.

**الـی‌آخـر** / elā.āxer, -āxar'/: [عربـی] *قیـد.* تـا ئاخر: ۱. تـا کۆتـایی ۲. *[مجـازی]* بـەم جـۆرە تـا ئاخر.

**الیـاف** / alyāf'/: [عربـی]*/سـم.* هـەودا؛ تـاڵ؛ ڕیشاڵ؛ ڕیشاڵە؛ ڕیشۆڵە؛ ڕهە.

▣ **الیاف درخت:** قاشک؛ پرزەی دار.

**الـــی‌الابـــد** / elal'abad'/: [عربـــی] *قیـــد.* هەتا‌ـهەتـا؛ بـۆ هـەمیشە؛ بـۆ هـەرگاڤـا؛ پـەی هەمیشەی؛ هەتا نەیماهێکی.

**الیـــسون** / elîson'/: [؟]*/ســـم.* گیانووســـە؛ گیاکێوسـانە؛ ڕوەکێکـی هـەمیـشەییـە لـە تـیرەی تـوور و کـەلـەرم گولـگەلێکـی زەرد و سپی دەکا.

**الـــی‌غیرالنهایـــه** / elāqeyronnahāye'/: [عربـی] *قیـد.* تـاخوا حـەزکـا؛ تـا بـیٚبڕانـەوە؛ هەتا‌ـهەتا.

**الیف** / alîf'/: [؟] ☜ روغن الیف، **روغن**

**الیکائی** / elîkā'î'/ ☜ **الیکایی**

**الیکایی** / elîkāyî'/: /اسم. ئێلیکایی؛ فیسقه؛ کەلەفندە؛ فیڕنەگولە؛ چۆلەکەمشکە؛ تیرەیەک لە پەلەوەرانی گردەڵە و خرپنەی زۆر بزۆز ❋ **الیکائی**

**الیگارشی** / olîgārşî'/: [فرانسوی]/اسم. ئولیگارشی؛ شێوازێکی دەسەلاتداری کە تێیدا، کۆمەڵگا بە دەستی چەند کەسی خاوەن هێزی ڕامیاری، چەکداری یان ئابووریەوە بەڕێ دەچێ.

**الیگوسن** / olîgosen'/: [فرانسوی]/اسم. ئولیگوسین؛ سێهەمین خول لە دەورانی سێهەمی زەوینناسی.

**الیم** / alîm'/: [عربی] صفت. /ادبی/ دڵ تەزێن؛ ئێشدار؛ بە ژان؛ بە سوێ؛ دڵتەوەسێن.

**ام** / am'/: صوت. کەپوو؛ پووک؛ پووگ؛ پووکاولە؛ چەمبۆلە؛ چەپۆلە؛ چەمۆلە؛ ئونک؛ مۆتە؛ گەشکە؛ گەشک؛ کەشکە؛ فێ؛ کردنەوەی پەنجە و ڕوو بە کەسێک گرتنی بە نیشانەی تووک لێ کردن.

**ام.** / em'/: [انگلیسی]/اسم. ناوی پیتی سێزدەهەمی ئەلف و بێتکەی لاتین (M,m).

**ام ـ** / em'/: پیشوند. ئەمـ؛ ئەڤـ؛ ئاـ؛ ـئم؛ ئیـ؛ ئیمـ؛ ئەمە ‹امروز: ئەمرۆ›.

**اما** / ammā'/: [عربی] حرف. بەلام؛ بەلا؛ ئەمما؛ ولام؛ لابەلێ؛ هما؛ هەمە؛ ئەما؛ بەلان؛ ئەمان؛ وەلێ؛ هەمە؛ بلان؛ وەلێکانێ؛ ڤێجا؛ ئەڤجا: ۱. هێشتا؛ هێشتای؛ هەلەی؛ هێشتاکوو؛ بەمەوە؛ بەو حاڵەشەوە ‹دیر به مدرسه رسیدم اما درس شروع نشده بود: درەنگ گەیشتمە قوتابخانە بەلام وانە دەستی پێنەکردبوو› ۲. نیشانەی نەرێ یا جیاکار ‹می‌خواستم کتاب بخرم اما پول نداشتم: دەمەویست کتێب بکرم بەلام پارەم نەبوو› ❋ **ولی؛ لیک؛ لیکن**

⊡ **اما آوردن:** /کنایی/ بڕو بیانوو تاشین؛ بەهانە هاوردنەوە؛ هەجەت و مەجەت ئێنان. هەروەها: **اما داشتن**

**اماج** / omāc'/: [ترکی]/اسم. پرتکە؛ ورتکە؛ گونکەگەلی گچکەی هەویر، کە دە ئاشی ئۆماجی دەخەن.

**امارات** / amārāt, 'emārāt'/: [عربی] ۱. جمعِ ☜ **امارت** ۲. جمعِ ☜ **اماره**

**ام. آر. آی.** / em.ār.āy'/: [انگلیسی] ☜ نمایش تشدید مغناطیسی، **نمایش**

**امارت** / amārat'، ـ ها؛ امارات/: [عربی]/اسم. ۱. میری؛ گەورەیی؛ سەرۆکی ‹در سال ۲۷۳ به امارت رسید: لە ساڵی ۲۷۳دا بە میری گەیشت› ۲. میرنشین؛ ئەمارەت؛ ولاتی بەردەستی ئەمیر ‹امارت بوتان: میرنشینی بۆتان›.

⊡ **امارت داشتن:** فەرمانڕەوایی کردن؛ فەرمان‌دان؛ گەورەیی کردن؛ میرایەیی کردن؛ سەرۆکی کردن ‹او سالها در لرستان امارت داشت: چەنای چەن ساڵ لە لورستاندا فەرمانڕەوایی کرد›. هەروەها: **امارت کردن**

**اماره** / amāre'، ـ ها؛ امارات/: [عربی]/اسم. ۱. /نامتداول/ نیشان؛ نیشانە ۲. /حقوق/ شوپ؛ شوێن؛ بار و دۆخێ کە بە بڕیاری قانوون یان بە پێی بۆچوونی دادوەر، بە نیشانەی کارێک دەژمێردرێت.

**ام. اس.** / em.es'/: [انگلیسی]/اسم. /پزشکی/ ئێیم.ئێس.؛ نێوی کورتکراوەی جۆرە نەخۆشینێکی مێشکە: **تصلب متعدد؛ تصلب منتشر**

**اماکن** / amāken'/: [عربی] جمعِ ☜ **مَکان**

**امالفساد** / ommolfesād'/: [عربی] صفت. /ادبی/ سەرچاوەی خراپی؛ سەرچاوە یان هەوێنی خراپکاری ‹تریاک امالفساد است: تریاک سەرچاوەی خراپیە›.

**امالقری** / ommolqorā'/: [عربی]/اسم.

*[قدیمی]* دایکی شاران؛ گرنگترین و بەنرخترین شوێنی سەرزەوین.

**اماله** / emāle'/: [عربی]*/اسم*. دەستوور؛ عیماله؛ ئیماله؛ حوقنە؛ ئامرازی ڕە وان کردن بە ڕژاندنی تراو بۆ ناو زگ.

▣ **اماله کردن:** عیمالەکردن؛ حوقنەکردن؛ خاوێنکردنەوەی ڕیخۆڵە بەشێوەی ڕژاندنە ناو زگی تراوی وەک ڕۆن بادام و ئاوی سابوون و ...

**امام** / emām'، ـها؛ ـان؛ ائمّه (ایمّه)/: [عربی] *اسم*. ۱. *[نامتداول]* پێشەوا؛ سەرۆک ۲. ئیمام؛ پێشرەو؛ سەرداری ئایینی موسڵمانان ۳. پێشنوێژ؛ بەرنوێژ ‹امام مسجد: ئیمامی مزگەوت› ٤. ئیمام؛ دەنکە هەرە درێژەکەی تەسبێح.

▣ **امام جماعت:** بەرنوێژ؛ پێشنوێژ؛ ئیمامی جەماعەت.

**امامت** / emāmat'/: [عربی]*/اسم*. ۱. پێشەوایی؛ پێشەنگی؛ ئیمامی ۲. پێشنوێژی؛ بەرنوێژی؛ وەرنمایی.

**امامزاده** / emāmzāde'، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. ۱. قسن؛ نەزرگە؛ نزرگە؛ گۆڕخانەی پیاوی خوا کە خەڵک دەچنە زیارەتی ۲. کوڕی ئیمام ۳. گۆڕی کوڕی ئیمام.

▣ **امامزادەی بی‌زینت:** *[مجازی]* سادە و بێزەرق و بەرق.

**امامزادەی بی‌معجزه:** *[مجازی]* کەسێ کە کارێکی لێ نابێتەوە و خەیرێکی لێ ناوەشێتەوە.

**امامزادەی جل‌بندی:** *[مجازی]* ۱. ماڵی پۆخڵەوات؛ ماڵی بە کەل‌وپەلی کۆن و فەقیرانەوە ۲. شڕەبار؛ کەسێ کە جل‌وبەرگی شڕ و کۆنە.

**امامیّه** / emāmîyye'/: [عربی]*/اسم*. ئیمامییە: ۱. شێعە؛ شیعە ۲. کەسانێ کە لەسەر ئەو بڕوایەن کە خودا بەشوێنی پێغەمبەردا حەزرەتی عەلی و پاشی ئەویش مندالانی بۆ ڕێبەرایەتی موسڵمانان هەڵبژاردووە.

**امان** / amān'/: [عربی]*/اسم*. ۱. ئامان؛ هێمنی و ئارامی؛ بێ ترسی؛ ئەمان ‹جهان امن و امان است: جیهان ئامانە› ۲. ئامان؛ پەنا.

▣ **امان از...:** هاوار لە...؛ داد لە...؛ هەی هاوار.

▣ **امان خواستن:** پەنا بۆ بردن؛ ئامان خواستن؛ هاتنە ڕایێ؛ هانا پەی بەردەی؛ پەنا بۆ کەسێک بردن بە هومێدی پارێزران.

**امان دادن:** پەنادان؛ پێئەمان دان؛ ئامان دان؛ هەڤاندن؛ گیان و ماڵی کەسێ پاراستن.

**امان کسی را بریدن:** *[کنایی]* کەسێک گیانەسەرکردن؛ بە ئەستۆ هێنانی کەسێ؛ واز لە کەسێ برین؛ بڕستی کەسێ بڕین.

**به امان آمدن:** *[کنایی]* بە ئەستۆ هاتن؛ گیانەسەر بوون؛ کەوتنە فەرتەنە.

**به امان خدا ول کردن:** *[کنایی]* بە تەنیاو بێچاوەدێر بە جێ هێشتن.

**به کسی امان ندادن:** *[کنایی]* دەرفەت نەدان بە کەسێک.

**در امان بودن:** لە ئەماندا بوون؛ لە ئەمن و ئاسایشدا بوون.

**امانات** / amānāt'/: [عربی] جمعِ ☜ **اَمانَت**

**امانت** / amānat'/: [عربی]*/اسم*. ۱. دەسپاکی؛ دڵپاکی ‹او در امانت معروف بود: لە دەسپاکیدا بەناوبانگ بوو› ۲. ـها؛ امانات/ ئەمانەت؛ ئامانەت؛ ئامانەتی؛ ئەوەی بۆ ئاگاداری لێکردن یان کەڵک لێ وەرگرتنی، بۆ ماوەیەک بە کەسێکی‌تر سپێردراوە ‹این پول پیش من امانت است: ئەم پارەیە لای منەوە

ئـەمانـەتـە›. ۳. ئـەمانـەت؛ کـار یـان ڕەوتی ئەسپاردنی شتێ بە کەسێکی تر بۆ ئاگاداری لێوە کردن ‹امانت گذاشتن: ئامانەت دانان›.

▣ **امانت خواستن:** ئەمانەت ویستن؛ ویستنی ئەمانەت؛ داوا کردنی شتێ لە کەسێک بە مەرجی دانەوەی.

**امانت دادن:** ئەمانەت دان؛ بە ئەمانەت دان؛ شتێ بۆ ماوەیەک و بە مەرجی هاوردنەوەی بە کەسێکی تر دان ‹راستی گردنبندی را کە امانت دادە بودی پس آوردند؟: ئەرێ ئەو ملوانکەیە بە ئەمانەتت دابوو هێنایانەوە؟›.

**امانت گذاشتن:** ئەمانەت دانان؛ بە ئەمانەت دان؛ شتێک بۆ پاراستن بە کەسێ سپاردن.

**امانت گرفتن:** قەخۆستن؛ بەئەمانەت گرتن.

**امانتدار** [1] / 'amānatdār، ـها؛ ـان/: اعربی/ فارسی]/اسم. ئەمانەتدار؛ ئەمانەتیدار؛ کەسێ کە پاراستنی ئەمانەتی بە ئەستۆیە ‹حاجی همیشە امانتدار همسایەها بود: حاجی هەمیشە ئەمانەتداری دراوسێکان بوو›.

**امانتدار** [2]: صفت. دەسپاک؛ ئەمین؛ ئەمانەتدار؛ ئەمیندار؛ دەستپاکژ؛ دروستکار لە ئەمانەتداریدا ‹آدم امانتدار: مرۆی دەسپاک›.

**امانتداری** / 'amānatdārî/: اعربی/ فارسی] /اسم. دەسپاکی؛ ئەمانەتداری؛ دەستپاکژی؛ چاودێری لە ئەمانەتی خەڵک.

**امانتفروشی** / 'amānatfurûšî، ـها/: اعربی/ فارسی]/اسم. ئەمانەتفرۆشی؛ فرۆشگایەک کە کەلوپەلی زۆرتر دەستەدوو بۆ فرۆش بە ئەمانەت لێی دادەنێن.

**امانتگذار** / 'amānatgozār، ـها؛ ـان/: اعربی/ فارسی]/اسم. ئەمانەتدانەر؛ کەسێ کە شتێک بە ئەمانەت لای کەسێکی تر دادەنێ.

**امانتی** / 'amānatî، ـها/: اعربی] صفت. خواس؛ قەرەتی؛ ئەمانەتی؛ ڕاگیراو بۆ دانەوە ‹کتاب امانتی: کتێبی ئەمانەتی›.

**امان‌نامه** / 'amān.nāme، ـها/: اعربی/ فارسی]/اسم. ئامان‌نامە؛ هەڤان‌نامە؛ نووسراوەیەکی ڕەسمی کە تێیدا پاراستنی گیان یان ماڵی کەسێک دەستەبەر بکرێت.

**امانی** / 'amānî/: اعربی] صفت. *[ادبی]* ئەمانەتی؛ خواستە؛ حەز؛ بە دۆخ یان شێوازی ئەمانەت ‹کالای امانی: کالای ئەمانەتی›.

**امپراتریس** / 'emprātrîs, 'emperāterîs، ـها/: [از فرانسوی]/اسم. ۱. ژنی شای شاهان؛ ژنی ئیمپراتۆر؛ قەڕاڵیچە؛ شابانوو؛ شاژن ۲. ژنی فەرمانڕەوای ئیمپراتۆریەتێک ✻امپراطریس

**امپراتور** / 'emp(e)rātûr، ـها؛ ـان/: [روسی] /اسم. ئیمپراتۆر؛ شای شاهان: **امپراطور**

**امپراتوری** / 'emp(e)rātûrî، ـها/: [روسی] /اسم. ئیمپراتۆری: ۱. پلە و پاگەی ئیمپراتۆر ۲. ئەو وڵاتانەی وان لە ژێر حوکمی ئیمپراتۆردا ✻ **امپراطوری**

**امپراطریس** / 'emprātrîs, 'emperāterîs/: [از فرانسوی] ☜ **امپراتریس**

**امپراطور** / 'emp(e)rātûr/: [روسی] ☜ **امپراتور**

**امپراطوری** / 'emp(e)rātûrî/: [روسی] ☜ **امپراتوری**

**امپرسیونیست** / 'amp(e)res(i)yonîst/: [فرانسوی] صفت. *[هنر]* ۱. ئەمپێرسیۆنیست؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئەمپێرسیۆنیسم ۲. */ها/* هۆگرەتی بە ئەمپێرسیۆنیسم.

**امپرسیونیسم** / 'amp(e)res(i)yonîsm/: [فرانسوی]/اسم. *[هنر]* ئەمپێرسیۆنیسم؛ ڕێبازێکی وێژەیی و هونەری کە لە

کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمی زایینیدا ڕسکا و ئامانجی شۆپگرەکانی چاوپۆشی لە حاشیە و پەراوێز و دەربڕینی گشتی وێنە یان بابەتێک بوو.

**امپریالیست** / 'amperyālîst/: [فرانسوی] صفت. [سیاست] ئەمپریالیست؛ خاوەن دەزگای ئەمپریالیسم؛ ئەمپریالیستی.

**امپریالیستی** / 'amperyālîstî/: [فرانسوی] صفت. [سیاست] ئەمپریالیستی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە ئەمپریالیسم ۲. خاوەن سیستەمی ئەمپریالیسم؛ ئەمپریالیست.

**امپریالیسم** / 'amperyālîsm/: [فرانسوی] اسم. [سیاست] ئەمپریالیسم؛ دوایین قۆناغی پێشڕەوتی دەزگای سەرمایەداری بە شێوەی لێهەڵکەوتنی قۆرغگەلی گەورە و دەسەڵاتانی ماڵی لە هەموو جیهاندا، بە ناردنی سەرمایە بۆ وڵاتانی ژێرفەرمان و گێرە وکێشە نانەوە بۆ زاڵ بوون بە سەر ئەو وڵاتانەدا.

**امت** / 'ommat، ـها؛ امم/: [عربی] اسم. ئۆمەت؛ گەل؛ نەتەوە؛ پێڕ؛ دەستەی پەیڕەوانی دینێکی تایبەتی؛ پەیڕەوانی ڕێبەرێکی دینی ‹امت محمد: ئومەتی موحەمەد›.

**امتثال** / 'emtesāl/: [عربی] اسم. [ادبی] فەرمانبەری؛ گوێ لە مستی؛ گوێڕایەڵی؛ گواهداری؛ کار یان ڕەوتی وەرگرتن و جێبەجێ کردنی فەرمانی کەسێک.

⊡ **امتثال امر**: بەجێ‌هێنانی دەسوور.

**امتحان** / 'emtehān، ـها؛ ـات/: [عربی] اسم. هێچ؛ ئەزموون؛ تاقیکاری؛ ئیمتیحان: ۱. ئازمایشت؛ کار و ڕەوتی تاقی کردنەوە ‹استحکامش را امتحان کن: هەستەمیەکەی تاقی کەوە› ۲. هەڵسەنگاندن؛ بەراوردکردنی ڕادەی زانینی قوتابیان یان خوێندکاران ‹امتحان کلاس چهارم: ئەزموونی پۆلی چوارەم› ۳. تاقی کردنەوەی شیاوی شتێک ‹امتحان بلندگو: تاقی کردنەوەی دەنگەوەرە›.

⊡ **امتحان دادن**: ۱. ئەزموون دان؛ ئیمتەحان دان؛ تێپەڕاندنی تاقی کردنەوە؛ بەشداری کردن لە ڕەوتی تاقی کردنەوەدا ۲. [کنایی] تاقی کرانەوە؛ ڕوون بوونەوەی چییەتی کەسێ یان شتێ لە ڕووی تاقی کردنەوەوە ‹خلبانها و هواپیماهای این شرکت در نیم قرن گذشته امتحان خود را دادەاند: فڕۆکەوانان و فڕۆکەگەلی ئەم شەریکەیە لە ماوەی نیو سەدەی ڕابردوودا تاقیکراونەوە›.

**امتحان کردن**: تاقی کردنەوە؛ ئازمایشت کردن؛ ئەزموون کردن؛ هێچاندن؛ زمنای.

**امتحانی**[1] / 'emtehānî/: [عربی] صفت. ئەزموونی؛ پێوەندیدار یان سەر بە تاقی کردنەوە ‹ورقەی امتحانی: لاپەڕەی ئەزموونی›.

**امتحانی**[2]: قید. [گفتاری] بۆ تاقی کردنەوە؛ بەئەزموون ‹امتحانی پوشیدم، اندازەام نبود: بۆ تاقیکردنەوە لە بەرم کرد، بۆ من نەدەبوو›.

**امتداد** / 'emtedād، ـها/: [عربی] اسم. ۱. درێژایی؛ لە ڕاستە ‹رودخانە در امتداد کوهها جریان دارد: چۆمەکە لە ڕاستەی کێوەکانەوە دەڕوا› ۲. درێژە ‹این جادە تا مهاباد امتداد دارد: ئەم ڕێگەیە تا مەهاباد درێژەی هەیە›.

هەروەها: **امتداد دادن**

⊡ **امتداد داشتن/ یافتن**: درێژەدار بوون؛ دوایی نەهاتن.

**امتزاج** / 'emtezāc، ـها؛ ـات/: [عربی] اسم. تێکەڵاوی: ۱. ئاوێتەیی؛ ئامێتەیی؛ تێکەڵی؛ هامێتەیی ۲. [شیمی] تێکەڵی دوو یا چەند ماکی کیمیایی پێکەوە.

**امتزاجپـــــــذیر** / emtezācpazîr'/: [عربـــی/ فارسی] *صفت*. تێکەڵگر؛ جووتەوگر.

**امتعه** / amta'e, 'amte'e'/: [عربی] جمعِ ☜ **مَتاع**

**امــتلا** / emtelā'/: [عربـی] *اسـم*. *[ادبـی]* پـڕی؛ پەڕی؛ کەیلی؛ تژەیی؛ هەبلاوی.

▣ **امــتلای معــده**: سـانجۆر؛ هـەبـل؛ کـەیلـی؛ پـڕی؛ لوقمـە؛ پیرومـەر؛ ئیفتـەلا؛ نـەخۆشـی گرفـــت کــــە لـــە ئــــەزم نـــەکـــردنی خواردەمەنیەوە تووش دێ.

**امتنــاع** / emtenā'، ـهـا/: [عربـی] *اسـم*. *[ادبـی]* خـــۆلادەری؛ دوورگـــری؛ ڕوو لـــێوەرگێـــڕی ‹امتناع او از دریافت پـول عجیـب نیست: خـۆبـاریزی لە وەرگرتنی پارە سەیر نیە؟›.

**امتنـــــان** / emtenān'/: [عربــــی] *اســـم*. سپاسـگوزاری؛ دەسـخوەشـانەیـی؛ مالـەوایـی؛ خاناوایی؛ پێزانی؛ شوکرانە بژێری.

**امتیــاز** / emtiyāz'، ـهـا، ـات/: [عربـی] *اسـم*. سەرپشکی: ۱. تازیاری؛ هـەڤـیازی؛ لـەسـەری؛ سەرتری؛ پێـشتری ‹امتیـاز او در ایـن اسـت کـە بـە چند زبـان تـسلط دارد: تازیـاری ئـەو لـەمـەدایـە کـە بەسەر چەند زواندا شارەزایـی هـەیـە› ۲. پـشک؛ سەربەشـی؛ سـەرپـشکاویەتی؛ سـەربـەشـایەتی ‹آرام در مـسابقەی هـوش ۱۰۵ امتیـاز آورد: ئـارام لـە کێبـەرکێـی هۆشـدا ۱۰۵ پـشکی هێنـا› ۳. سـەربـەشـایەتی؛ مـافی تایبـەتی؛ ڕێپێـدانێک لە لایەن دەوڵـەتـەوە بـۆ کـردنی کـارێ ‹امتیـاز انتـشار روزنامـە: سـەربـەشـایەتی بـلاو کردنـەوەی ڕۆژنامە›.

▣ **امتیـــــاز دادن**: ۱. پـــــشک دان؛ دانی سـەرپـشکنامە بـە کـەسـێ ۲. *[مجـازی]* نمـرەدان؛ دانی نمـرە بـە بـەشـدار بـوونی کێبـەرکـێ ۳. *[کنـایی]* سەرپـشکی دان؛ سـەربـەشـایەتی دان؛ مـافی تایبـەتی دان ‹شاه بـە آمریکـا امتیازهـای زیـادی داده بـود: شـای ئێـران سـەرپـشکی زۆری دابـوو بـە ئـەمریکـا›.

هەروەها: **امتیاز گرفتن**

**امتیازنامـــه** / emtiyāznāme'/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **امتیاز-۳**

**امتیـــــازی** / emtiyāzî'/: [عربـــی] *صـــفت*. سەربەشـێنە؛ سـەرپـشکی ‹چهـار امتیـازی: چـوار سەربەشینە›.

**امثــال** / amsāl'/: [عربـی] ۱. جمـعِ ☜ **مَثَــل** ۲. جمعِ ☜ **مِثل**

**امثله** / amsale, 'amsele'/: [عربی]جمعِ ☜ **مَثَل**

**امحــا** / emhā'/: [عربـی] *اسـم*. *[ادبـی]* کـردە و کـارەڕەهـاتی نـوغرۆ کـردن؛ کـلێس کـردن؛ هەشفاندن؛ هەرشاندن؛ تیا بردن؛ لەبەین بـردن؛ خـاپوورکردن؛ مـەحفـەوکـردن ‹امحـای جنگلهـا: تیابردنـی دارستانان›.

**امــداد** / emdād'، ـهـا/: [عربـی] *اسـم*. یارمـەتی؛ کۆمـەک؛ یـاردەی؛ فریـا؛ بـازگوری؛ کـار یـان ڕەوتی فریـا کـەوتـن، بـە تایبـەت بـە هانـا گەیشتنی زیان لێکـەوتـوان بـە هـۆی ڕووداوی سروشـتی یـان شـەڕەوە ‹گروههـایی از مـردم بـە امـداد آسیبدیـدەگـان شـتافتند: دەسـتەگـەلـێ لـە خەڵک چوونە یارمەتی زیان لێکەوتووانەوە›.

**امدادرســانی** / emdādresānî'، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] *اسـم*. یاریـدەری؛ کـار یـان ڕەوتی بـە دادگـەیـشتنی هـەژار و دامـاوان، بـە تایبـەت ئەوانەی کە بـە چـەترمـەگـەلی سروشـتی یـان شەڕ و ئاژاوە تووشیار بووگن.

**امــــدادگر** / emdādgar'، ـهـا، ـان/: *اسـم*. فریـاڕەس؛ یارمـەتیـدەر؛ ئاریکـار؛ هاریکـار؛ کـەسـێ کـە کـاری یارمـەتی گـەیانـدن بـە داماوان و لێقەماوانە.

**امـــــدادی** / emdādî'/: [عربـــی] *صـــفت*. یارمـــەتیدەر؛ ئاریکـــار ‹نیروهـــای امـدادی: هێزگەلی یارمەتیدەر›.

**امــر** / amr'، ـهـا/: [عربـی] *اسـم*. ۱. / اوامـر/ فەرمان؛ دەسـوور؛ دەسـتوور؛ فـەرمـان؛ ئـەمـر؛

هـەود ۲. / امور/ کـار؛ هـەرمانـە؛ ئـیش؛ کـار و بـار ۳. *[دستور]* فـەرمـان؛ فرمـان؛ وشـەیـەکـە ئەنجـامی کـارێکی دەوێـت (وەکـوو: برو، بیایید، بخوانید: بچـۆ، بـێن، بخـوێنن) ٤. ڕووداو؛ پێشاما؛ پێشهات؛ ڕێکەوت.

▣ **امر به معروف:** فەرمـان بـە چاکـە؛ ڕاسـپاری بەچاکە.

**امـر خیـر:** ۱. کـاری چـاک؛ کـاری نـووک؛ کاریٚ قەنج ۲. *[کنایی]* زەماوەن؛ گۆوەند.

**امـر واقـع:** کـاری کـراو؛ کـەردەوە؛ ئـەوەی ڕووی‌داوە.

▣ **امـر بـه کـسی مـشتبه شـدن:** لـە خـۆ بـایی بـوون؛ لـە خـۆ خـەرە/ خـەڕا بـوون؛ لـە بـەر لـووتبـەرزی، دەور و بـەری خـۆ بـاش نـەناسـین ‹دو بـار کـه سـلام کـردیم، امـر بهـش مشتبه شد و خیال کـرد بـرای خـودش کـسی اسـت: دووجار کە چـاک‌وخۆشـیمان لـەگـەڵ کـرد، لـە خۆ بایی بوو، وایدەزانی بۆ خۆی شتێکە›.

**امر دادن:** فرمـان‌دان؛ دەسـووردان؛ فـەرمـان کردن. هەروەها: **فرمان کردن**

**امرا** / 'omarā/: [عربی] جمعِ ☜ **امیر**

**امرارمعـــاش** / 'emrārema'āš, -māāš/: [عربـی] *اسم.* کاری ژیـان بردنـە سـەر؛ گـوزەرانی ژیـان؛ ژیـــان بـــەڕێـــوە بـــردن؛ بژیـــو دەرهێنـــان؛ قـەرقـەدانـدن ‹او از دسـترنج خـودش امـرار معـاش مـی‌کـرد: ژیـنی بـە دەسـڕەنجـی خـۆی دەبـردە سەر›.

**امراض** / 'amrāz/: [عربی] جمعِ ☜ **مَرَض**

**امـــرأەالمسلـــسله** / 'emra'atolmosalsale/: [عربی] ☜ زن پای در زنجیر، **زن**

**امربـر** / 'amrbar، ـها؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی] *اسم.* سـەربـازێ کـە ئـەرکـی جێبـەجـێ کـردنی کارگـەلی ڕاژەیـی ئـەفـسەری سـەربازخانـەیـە (وەک پـاک و خـاوێن‌کردنـەوەی ژوور وگـەیانـدنی ڕاسپاردە و ...).

**امـــرد** / 'amrad، ـهـا/: *اسـم.* بـێ‌تـــووک؛ لاوژۆکـی؛ بـێ‌مـوو؛ کوڕێژگـەی هێـشتا مـوو دەرنەکەوتوو.

**امردبـــاز** / 'amradbāz، ـهـا؛ ـان/: [عربـی/ فارسی] *اسم.* یزباز؛ بەچەباز.

**امرداد** / 'amordād/ ☜ **مُرداد**

**امـــرود** / 'amrûd، ـهـا/: *اسـم.* ۱. هـەرمـێ کێویلـە؛ هـەمرۆکێفیلـە؛ هـەمرۆکووجیلـە؛ هـەمرۆکۆڵـە؛ مرووکوولـە ۲. *[ادبی]* هـەرمـێ؛ هـەمـرۆ؛ هـەمرۆگـولاوی؛ مـرۆ؛ هرمیـک؛ مێوەیەکی بـن‌خـڕی درێژووکـەیـە، زۆر جـۆری هەیە و پاییزان دەگات.

**امـــروز**[1] / 'emrûz/: *اسـم.* ئـەمـرۆ؛ ئیمـڕۆ؛ ئـەمـڕۆژ؛ ئیمـڕۆژ؛ ئـەورۆ؛ ئـارۆ؛ هـارۆ؛ ئـەڤـرۆ؛ ئـیرۆ؛ ئێـرۆ: ۱. ڕۆژێ کـە تێیـداین؛ نـەدوێکـە نەسۆزی ‹امروز جمعـه اسـت: ئـەمـرو هـەینیـە› ۲. *[مجازی]* ئەم ڕۆژگـارە؛ ڕۆژگـار یـان سـەردەمـی ئێستا ‹جوانهـای امـروز را نمـی‌شـود گـول زد: لاوانی ئەورۆ فریو نادرێن›.

**امـروز**[2]: *قید.* ئـەمـڕۆ؛ ئـەورۆ؛ ئیمـڕۆ؛ ئیمـڕۆژ؛ ئیرۆ؛ ئارۆ: ۱. لـە ڕۆژێکـدا کـە تێیـداین ‹امـروز مـی‌آیـد: ئـەمـرو دیـت› ۲. لـەم ڕۆژگـارەدا؛ ئـەورۆکـە؛ لـەم سـەردەمـا ‹امـروز دیگـر مـردم آگاهند: ئەمرۆ ئیتر خەڵکی بەخەبەرن›.

**امـــروز و فـــردا**[1] / 'emrûz-o-fardā/: *اسـم.* ئــەمــڕۆ ســبەی؛ ئێمــڕۆ ســۆزی؛ ئیمــڕۆ و شەوسۆ؛ ئیمرۆ و سوو؛ لـەم ڕۆژانـە؛ چـی‌ڕوانـە؛ ئارۆ سەبەی؛ ڕۆژانی داهاتووی نزیک.

▣ **امـروز و فـردا کـردن:** ئـەمـڕۆ و بـەیـانی کـــردن؛ ئیمـــڕۆ ســـۆزی‌کـــردن؛ دەســـی دەسی‌کردن؛ ئـەمـڕۆ سـبەی کـردن ‹آن قدر امـروز و فـردا کـرد کـه زمـستان شـد و همـه جـا را بـرف گرفـت: ئـەوەنـدە ئـەمـرو و بـەیـانی کـرد، زستان هات و بەفر دنیای داگرت›.

**امروزوفردا**[2]: *قید.* ئەمـڕۆ و بـەیـانی؛ ئـەمـڕۆژ و

سبەی؛ ئیمڕۆ سۆزی؛ ئیمڕۆ شەوسۆ؛ لەم ڕۆژانە؛ ئارۆ سوا؛ لەمڕۆژانەدا؛ بەم زووە ‹امروز و فردا است کە بیاید: ئەمرو و بەیانیە کە بێت›.

**امروزه** / emrûze/': صفت. ئیمڕۆژە؛ ئیمڕۆژی؛ ئیمڕۆیی؛ ئەمڕۆکە؛ ئارۆیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کاتی ئێستا ‹جوان امروزه چشم و گوشش باز شده است: لاوی ئیمروژی چاو و گوێی کراوەتەوە›.

**امروزەروز** / emrûzerûz/': قید. [گفتاری] ئەمڕۆکانێ؛ لەم کاتانە؛ ئێستا ئیدی؛ ئارۆ ئیتر؛ لەم ڕۆژگارەدا ‹امروزەروز کسی این حرفها را باور نمی‌کند: ئەمڕۆکانی کەسێ ئەم قسانە باوەڕ ناکا›.

**امروزی** / emrûzî/': صفت. ئیمڕۆژی: ۱. [گفتاری] ئەمڕۆکە؛ ئەوڕۆکە؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئیمڕۆژە ‹نان امروزی کوچکتر است: نانی ئیمروژی چکۆلەترن› ۲. /ـها/ ئەمڕۆیی؛ ئیمڕۆیی ‹جوان امروزی: لاوی ئیمروژی›.

**امرونهی** / amr-o-nahy/': [عربی]/اسم. [مجازی] کار یان ڕەوتی دەسووردان؛ فەرمان‌دان بە دیتران ‹بعضی‌ها از امر و نهی به دیگران لذت می‌برند: بڕێک لە فەرمان‌دان بە دیتران خۆشیان دێت›.

**امریسیم** / amrîsiyom/': [فرانسوی] ☜ **آمریکیُم**

**امریکائی** / emrîkā'î/ ☜ **امریکایی**

**امریکایی** / emrîkāyî/ ☜ **آمریکایی: امریکائی**

**امریه** / amrîyye/'، ـها/: [عربی]/اسم. دەسوور؛ فەرمان (چ نووسراوە بێت چ سەرزارەکی).

**امزجه** / amzece/': جمعِ ☜ **مِزاج**

**امساک** / emsāk/': [عربی]/اسم. ۱. خۆپاریزی؛ کار یان ڕەوتی بەر خۆگرتن بەتایبەت لە خواردنی شتێک بە ئەندازەی پێویست ‹امساک از خوردن و نوشیدن: خوپاریزی لە خواردن و خواردنەوە› ۲. چرووکی؛ چکووسی؛ دەس قونجاوی؛ بەرچاوتەنگی؛ ڕژدی؛ دەس‌بەسیاگی ‹این اندازه امساک خوب نیست: ئەوەندە چرووکی باش نیە›. هەروەها: **امساک کردن**

**امسال** [1] / emsāl/':/اسم. ئەوسالْ؛ ئەمسالْ؛ ئیمسالْ؛ ئێسالْ؛ ئەمسار؛ ئەمسەر؛ ئمسالْ؛ سالێ کە تێیداین ‹محصول امسال خوب بود: داهاتی ئەوسال باش بوو›.

**امسال** [2]: قید. ئەمسالْ؛ ئیمسالْ؛ لە سالێک کە تێیداین ‹امسال باید خوب کار کنم: ئەمسال دەبێ باش کار بکەم›.

**امساله** / emsāle/': صفت. ئەمسالی؛ ئیمسالی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئیمسالْ ‹نهالهای امساله خوب رشد کرده‌اند: نەمامەکانی ئەمسالی باش گەورە بووگن›.

**امسالی** / emsālî/'، ـها/: صفت. [گفتاری] ئیمسالی؛ ئیمساله؛ ئیمسالگین؛ هین ئیمسالْ؛ هی ئیمسالْ؛ یاقساله؛ یائیسال.

**امشاسپند** / amšāspand/'، ـان/: اسم. ئەمشاسپەند؛ هەرکام لە فریشتەکانی بارەگا یان ئیزەدانی ئایینی زەردەشت، کە شەش یان حەوتن.

**امشب** [1] / emšab/':/اسم. ئەمشەو؛ ئیمشەو؛ همشەو؛ ئەمشۆ؛ ئەوشۆ؛ ئمشەو؛ ئێشەو؛ ئێشەڤ؛ ئەڤشەڤە؛ ئیشەڤ؛ شەوێ کە تێیداین ‹درس امشب تمام شد: وانەی ئەمشەو دوایی هات›.

**امشب** [2]: قید. ئەوشۆ؛ ئەمشەو؛ ئەمشۆ؛ لە شەوێکدا کە تێیداین ‹امشب زود می‌آیم: ئەوشو زوو دێم›.

**امشبی** / emšabî/': صفت. [گفتاری] ئیمشەوی؛ ئەمشەوی؛ ئیمشەوگین؛ وێشەڤێ؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئەمشەو.

**امشی** / emšî/': [انگلیسی از عربی]/اسم.

ئیمشی؛ تراوی جڕ و جانەوەر کوژە کە لە نەفت چێ دەبێ.

▣ **امشی زدن:** ١. ئیمشی پژاندن؛ ئیمشی لێدان؛ ڕژاندنی ئیمشی بۆ دەرکردن یا کوشتنی جڕ و جانەوەر ٢. *[کنایی]* تاراندن؛ دەرکردن؛ دەرئێخستن؛ کرنەوەر؛ ڕواندن؛ هەسر بیایش؛ چێوراندن؛ ئەرە زنیەی.

**امضا** / emzā'. ـها/: [عربی]/*اسم.* واژۆ؛ ئیمزا؛ ناو یا دروشمێکی تایبەتی، نیشانی پێناسەی کەسێک کە زۆرتر بۆ وەرگرتن و پەسند کردنی نووسراوەیەک بە کار دێ.

▣ **امضا دادن:** ئیمزادان: ١. بۆ یادگاری و بیرەوەری شتێک ئیمزا کردن ‹به هوادارانش امضا می‌داد و دستشان را می‌فشرد: ئیمزای دەدا بە لایەنگرەکانی و دەستیانی دەگووشی› ٢. *[مجازی]* گفت و پەیمان دان بە شێوەی نووسینی ‹حاضرم امضا بدهم که هر وقت قالی را آوردی، پولت را بگیری: ئامادەم ئیمزا بدەم کە هەر کاتێک قالیەکەت هێنا، پارەکەت وەربگری›.

**امضا شدن:** ئیمزا کران؛ ئیمزا بوون؛ دروست بوون؛ پەسند بوونی نووسراوەیێک بە ئیمزا ‹حکم انتقال شما امضا شد: بڕیاری ڕاگواستنی ئێوە ئیمزا کرا›.

**امضا کردن:** ئیمزا کردن؛ واژوو کرن؛ پەسند کردنی نووسراوەیێک بە کێشانی ئیمزا لە پایدا ‹زیر ورقه را امضا کرد: خواری بەرگەکەی ئیمزا کرد›.

**امضا گذاشتن به پای چیزی:** ئیمزا کردنی شتێک؛ ئیمزا نانە پای شتێکەوە.

**امضا گرفتن:** ئیمزا گرتن: ١. وەرگرتنی ئیمزا لە کەسێکی بەناوبانگ لە لایەن هەوادارەکانیەوە بۆ یادگاری ٢. گرتنی ئیمزا لە کەسێک بە نیشانەی پەسند کردن لە لایەن ئەو کەسەوە.

**به امضا رساندن:** ئیمزا وەرگرتن؛ کاری جێبەجێ‌کردن بەهۆی ئیمزایەکەوە.

**امضاسازی** / emzāsāzî'. ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* واژۆسازی؛ هەڵبەستنی ئیمزای کەسێکی‌تر.

**امعاء** / am'ā'/: [عربی]/*اسم.* جیق؛ هەناو؛ ناوزگ؛ ناوسک؛ ڕیخۆڵان؛ ڕۆخلەی؛ هناڤ.

**امعان** / em'ān'/: [عربی]/*اسم.* *[ادبی]* کنە؛ کنەوە؛ کار یان ڕەوتی لێکۆڵینەوە؛ لێڕامان؛ لێورد بوونەوە؛ تۆژینەوە؛ ڤەکۆلین؛ هلکەواشتن؛ هلکەوشاندن.

▣ **امعان نظر:** وردبینی؛ دوورنواڕی؛ دوانواڕی؛ هویربینی.

**امعاواحشا** / am'ā-vo-ahšā'/: [عربی]/*اسم.* جیق؛ هەناو؛ هناڤ؛ دلێ‌لەم؛ ناوزگ؛ ناوسک (وەک ڕیخۆڵە و گەدە).

**ام‌قرفه** / ommeqorfe'/: [عربی] ☜ **پانگوڵن**

**امکان** / emkān'. ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم.* بووز؛ بوز؛ بۆ؛ ژێهاتی؛ ئەڵکەفت؛ ئیمکان؛ دۆخ یان چۆنیەتی بۆ لوان.

▣ **امکان دادن:** ڕەخساندن؛ پێکهێنان؛ مومکین‌کردن؛ ڕێدان؛ بۆ لواندن؛ بۆ شیاندن ‹سربازی به او امکان داد با سختیها آشنا شود: سەربازی بۆی ڕەخساند کە سەختی بناسێت›.

**امکان داشتن:** دوور نەبوون؛ مومکین بوون؛ لوان؛ ژێهاتن؛ ئەگەر بوون؛ وەخت بوون ‹امکان داشت زخمی بشوی: دوور نەبوو بریندار ببی›.

**امکان یافتن:** بۆ لوان؛ بەدەس هێنانی دەرفەت؛ بەدەست هاوردنی ئیمکان؛ بۆ ڕەخسان؛ بۆ شیان ‹با آمدن به سلیمانی امکان یافت که تحصیل کند: بە هاتنی بۆ سلێمانی بوی لوا بخوێنێ›.

**امکانات** / emkānāt'/: [عربی]/اسم. دەرفەت یا توانایی پێویست بۆ ئەنجامدانی کارێ.

**امکانپذیر** / emkānpazîr'/: [عربی/ فارسی] صفت. بووزخۆر؛ شتێ یان کارێک کە بۆی هەبێ سەربگرێ.

**امکنه** / amkene'/: [عربی] جمعِ ☜ **مَکان**

**امل** / amal'، آمال/: [عربی]/اسم. [ادبی] ئاوات؛ کام؛ ئارەزوو؛ هیڤی.

**امل** / ommol'، ـها/: [عربی] صفت. [گفتاری] کۆنەپەرست؛ کەڤنەپەرێس؛ دواکەوتوو؛ هۆگری داب و دەستوور و بیر و بڕوای کۆن ‹آدم امل: مرۆی کونەپەرست›.

**املا** / emlā'، ـها/: [عربی]/اسم. نژوە؛ ڕێنووس؛ لەبەر گوتە نووسینەوە؛ ئیملا؛ نووسینەوەی وتەی کەسێکی‌تر.

▣ املا کردن: گوتنەوە؛ نژوەگوتن؛ گوتن بۆ ئەوەی بینووسنەوە.

املا نوشتن: نژوە نووسین؛ نووسینەوە؛ نووسینی ئەو شتەی کە لە لایەنی کەسێکی‌ترەوە ئەگوترێت.

**املائی** / emlā'î'/: [عربی] ☜ **املایی**

**املاح** / amlāh'/: [عربی]/اسم. [ادبی] خوێگەل؛ خوێ؛ مەکی.

**املاک** / amlāk'/: [عربی] جمعِ ☜ **مِلک**

**املایی** / emlāyî'/: [عربی] صفت. نژوەیی؛ پێوەندیدار بە نژوە ‹غلط املایی: هەڵەی نژوەیی›: **املائی**

**املت** / omlet'/: [فرانسوی]/اسم. هێلکە و تەماتە؛ هیلکە و تۆماتێز؛ پێخۆرێکی هەموانییەکە بە هیلکە و تەماتە یان جۆرگەلی گۆشت و سەوزە چێ دەبێ و زوو پێدەگا.

**املس** / amlas'/: [عربی] صفت. هول؛ حول؛ ساف؛ لووس.

**املی** / ommolî'/: [عربی] صفت. [گفتاری] کۆنەپەرستانە؛ کۆنەپەرستیانە ‹وای از دست این عادتهای املی تو: ئای لە دەس ئەم عادەتە کونەپەرستانەت›.

**امم** / omam'/: [عربی] جمعِ ☜ **اُمَّت**

**امن** / amn'/: [عربی] صفت. هێمن؛ بێ‌خۆف؛ ئەمن؛ بە ئاسایش.

▣ **امن بودن**: هێمن بوون؛ ئەمن بوون: ۱. هێمنایەتی هەبوون ‹شهر امن است: شارەکە هیمنە› ۲. بێ‌مەترسی بوون؛ بێ‌ترس بوون ‹جادەها امن نیست: جادەگەل ئەمن نین›. هەروەها: **امن شدن؛ امن کردن**

**امنا** / omanā'/: [عربی] جمعِ ☜ **اَمین**

**امن‌وامان** / amn-o-amān'/: [عربی] صفت. مەند و ئارام؛ هێمن؛ بێ‌کێشە؛ هێور و ئارام.

**امنیت** / amnîyyat'/: [عربی]/اسم. هێمنی؛ هێمنایەتی؛ ئاسوودەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی مەترسی یان بشێوە ‹کشور از امنیت برخوردار است: ولات هێمنایەتی هەیە›.

**امنیه** / amnîyye'/: [عربی]/اسم. [قدیمی] ۱. /ـها/ ژاندارم؛ قۆلچی؛ جەندرمە ۲. ژاندارمری ‹او را گرفتند و بردند ادارەی امنیه: گرتیان و بردیانە ژاندارمری›.

**اموات** / amvāt'/: [عربی] جمعِ ☜ **مَیِّت**

**امواج** / amvāc'/: [عربی] جمعِ ☜ **مَوج**

**اموال** / amvāl'/: [عربی] جمعِ ☜ **مال**

▣ **اموال غیر منقول**: [حقوق] مردەماڵ؛ مردە؛ ماڵی بێ‌گیان؛ شت و مەکێک کە ڕاناگوێزرێ.

**اموال منقوله**: [حقوق] زیندەماڵ؛ میری؛ ماڵ و داراییەک کە ڕادەگوێزرێ.

**اموال وقف**: [حقوق] وەڕەستا؛ ماڵی مەوقووفە.

**امور** / umûr', omûr'/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **آمر**

**امورات** / 'umûrāt, 'omûrāt/: [عربی] اسم. جمعِ ☜ **امور**

▣ **امورات خود راگذراندن**: کار خۆ خستنه‌ڕێ؛ خو بردنه‌ڕێوه؛ پێویستیه‌کانی خۆ جێبه‌جێ‌کردن.

**امورات کسی گذشتن**: کار و بار چه‌رخان؛ پێداویستیه‌کانی دابین بوون.

**اموی** / 'omavî، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. ئومه‌وی؛ ئه‌مه‌وی؛ پێوه‌ندیدار یان سه‌ر به حوکمدارانی ئومه‌وی که دوو زنجیره فه‌رمانڕه‌وای ولاته ئیسلامیه‌کان ــ له شام و ئه‌نده‌لوسدا ــ بوون.

**امه** / 'omme/: [ترکی] اسم. [فرهنگ‌مردم] تۆم‌تکاوی؛ جۆره نه‌خۆشینێکه له کوڕانی لاوژۆکه، ژنانی مناڵ به به‌رۆک و بڕێک له که‌سان، به هه‌ڵماسانی خا، په‌نه‌مانی مه‌مک یان یاوکردن به هۆی دیتنی خوارده‌مه‌نی خۆش یان هه‌ڵمژینی بۆیانه‌وه ڕووده‌دا.

**امهات** / 'ommahāt/: [عربی] اسم. [ادبی] بنه‌ما؛ بنه‌وا؛ ژێده‌ر؛ ئه‌وه‌ی که سه‌رچاوه و بناخه‌ی شته‌کانی‌تره ‹شرفنامه از امهات آثار تاریخی کرد است: شه‌ره‌فنامه له بنه‌ماکانی ئاسه‌واری مێژوویی کورده›.

**امهاری** / 'amhārî/: اسم. ئه‌مهاری؛ زمانی زۆربه‌ی خه‌ڵکی حه‌به‌شه (ئیتیۆپی) له زمانه سامیه‌کان.

**امی** / 'ommî/: [عربی] صفت. [ادبی] ۱. دایکی؛ ئه‌دایی ‹جد امی: باپیری دایکی› ۲. نه‌خوێنده‌وار؛ نه‌خوێنه‌وار؛ نه‌خوه‌نه‌؛ بێ‌سه‌واد؛ بێ‌خه‌ت؛ بێ‌نقه‌سین؛ که‌سێک که ده‌رسی نه‌خوێندبێت.

**امیال** / 'amyāl/: [عربی] اسم. ۱. جمعِ ☜ **مِیل** ۲. ئاواتگه‌ل؛ داخوازگه‌ل؛ ئاره‌زووگه‌ل؛ وازێ؛ ئاواتێ.

**امید** / 'om(m)îd، ـها/: اسم. هیوا؛ ئومێد؛ هومێد؛ همێد؛ هومێ؛ ئومێ؛ همێ؛ ئموود؛ هه‌ویا؛ ته‌وا؛ هۆ؛ بازگوڕ؛ هێوی؛ هێڤی: ۱. ئاره‌زوویێک که هیوای به‌جێ‌هاتنی هه‌یه ‹امید او پیروزی است: هیوای به سه‌رکه‌وتنه› ۲. چاوه‌ڕوانی ڕووداوێکی خۆش ‹به امید موفقیت: به هیوای سه‌رکه‌وتن› ۳. [ریاضی] هه‌ندی چاوه‌ڕوان‌کراو له کۆمه‌ڵه‌یێکدا ‹امید زندگی در ایران ۴۰ سال است: هیوا به ژیان له ئێراندا ٤٠ ساڵه›.

▣ **به امید**: به هیوای؛ به ئاواتی ‹به امید آن روز: به هیوای ئه‌و ڕۆژه‌وه›.

▣ **امید بستن**: هیوا خۆشکردن؛ دڵ پێ خۆشکردن؛ له که‌سێک یا شتێک گومانی پێک هاتنی ئاره‌زوو کردن ‹مادر وطن به هوشیاری فرزندانش امید بسته است: دایکی نیشتمان به هۆشیاری منداڵه‌کانی هیوای خوشکردووه›.

**امید دادن**: هیوادارکردن؛ هێڤیدارکرن؛ دڵگه‌رمی‌دان. هه‌روه‌ها: **امید داشتن**

**امیدبخش** / 'om(m)îdbaxš/: صفت. هیوابه‌خش؛ هومێده‌ده‌ر؛ هۆ یا مایه‌ی هیواداری ‹سخنان امیدبخش: قسانی هیوابه‌خش›.

**امیدوار** / 'om(m)îdvār، ـان/: صفت. ۱. به‌هیوا؛ به‌هومێد؛ دڵ‌به‌هومێد؛ بهێڤی؛ هیوادار؛ هێویدار؛ هێڤیدار؛ هومێده‌وار؛ به‌ئاوات؛ خاوه‌ن ئومێدداریه‌تی ‹او به برنده شدنش امیدوار است: ئه‌و به به‌ره‌نده بوونی هیواداره› ۲. دڵگه‌ش؛ دڵخۆش؛ دڵگه‌رم؛ خۆشبین؛ به گه‌شبینی؛ هه‌ر به هومێد ‹همیشه به آینده امیدوار بود: هه‌میشه به داهاتوو هیوادار بوو›.

▣ **امیدوار بودن**: هیوادار بوون؛ هومێده‌وار بوون؛ به هیوا بوون؛ هێڤی بوون.

**امیدوار شدن:** هیوا پەیاکردن؛ هیوادار بوون.

**امیدوار کردن:** هیوادارکردن؛ هیوادان؛ دڵگەوی داین.

**امیدوارانه** [1] / 'om(m)îdvārāne/: *صفت.* هیوادارانە؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی هیواداریەوە ‹با چشمانی امیدوارانه، منتظر پاسخ من بود: بە چاوگەلێکی هیوادارانەوە، چاوەڕوانی وەلامی من بوو›.

**امیدوارانه** [2]: *قید.* هیوادارانە؛ بە هومێدواری؛ بەهومێدەوە ‹امیدوارانه درس می‌خواند: هیوادارانە دەرسی دەخوێند›.

**امیدواری** / 'om(m)îdvārî، ـها/: *اسم.* هیواداری؛ هومێدەواری؛ بەهومێدی: ١. دڵگەوی؛ دڵگەرمی دۆخێکی هەستیاری کە وێڕای خۆشبینی بە داهاتوو یان ڕوودانی کارێکی دڵخوازە ‹امیدواری به آینده: هیواداری بە داهاتوو› ٢. دۆخ یان چۆنیەتی هیوادار بوون ‹امیدواری اساس زندگی است: هیواداری بناغەی ژینە›.

**امیر** / 'amîr، ـان؛ أمرا/: [عربی] *اسم.* میر: ١. سەرۆک؛ سەردار؛ ئەمیر؛ فەرمانڕەوا؛ میر ‹امیر جزیره و بوتان: میری جزیر و بۆتان› ٢. *[نظامی]* تیمسار؛ ئەمیر ٣. *[قدیمی]* نازناوی شازادە و گەورەگەل ‹امیر شرفخان بدلیسی: میر شەرەفخانی بدلیسی›.

**امیرالحاج** / 'amîrolhāc/: [عربی] *اسم.* بالحەج؛ پێشەنگی حاجیان؛ سەرپەرشتی حاجیانی وڵاتێک لە حەجدا.

**امیرالمومنین** / 'amîrolmo:menîn, 'amîrolmo'menîn/: [عربی] *اسم.* *[قدیمی]* فەرمانڕەوای موسڵمانان؛ میری موسڵمانان.

**امیرزاده** / 'amîrzāde/: [عربی/ فارسی] *صفت.* میرزادە؛ بەچکەمیر؛ کوڕەمیر.

**امیرنشین** / 'amîrnešîn، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* میرنشین؛ جێگەی ژیانی میر؛ وڵاتێک کە لە لایەن ئەمیرێکەوە بەڕێوە دەچێت.

**امین** [1] / 'amîn، ـان؛ أمنا/: [عربی] *اسم.* *[حقوق]* ئەمین؛ کەسێک کە لە باری قانوونیەوە کارگێڕی ئاگەداری و بەڕێوە بردنی ماڵی کەسێکی ترە.

**امین** [2]: *صفت.* دەسپاک؛ سەرڕاست؛ ئەمین؛ جێ‌باوەڕ؛ باوەڕپێکراو؛ جێ‌باوەڕی؛ ئاڤدەست؛ بێ‌خواری و لاری ‹او مردی امین است: پیاوێکی دەسپاکە›.

**ان** / 'an/: *اسم.* *[مستهجن]* گوو؛ گی؛ عەن؛ ئەن؛ ئەنە؛ پیسی؛ چەپەڵی.

**ان** / 'en/: [انگلیسی] *اسم.* ١. ناوی پیتی چواردەهەمی ئەلف و بێتکەی لاتین (N,n) ٢. *[ریاضی]* ژمارە یان ئەندازەی بێ‌بڕانەوە.

**اناث** / 'onās/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* مێ؛ مێوینە؛ مێینە؛ مرۆی مێینە، چ ژن چ کچ.

**انار** / 'anār، ـها/: *اسم.* هەنار؛ نار؛ هنار؛ ئەنار؛ هنارێر: ١. دار یان دارچکێکی دڕکاویە چێوێکی پتەوی هەیە و گوڵێکی سوور و گچکە (گلیار) دەکا ٢. میوەی ئەو دارە کە پاییز پێدەگا و قاپێلکی خڕە و زۆر دەنکی ترش و شیرین و مێخۆشی تێیدایە.

**انارستان** / 'anārestān، ـها/: *اسم.* هەنارستان؛ نارسان؛ ئەنارلۆ؛ باغی هەنار.

**انبار** / 'ambār, 'anbār، ـها/: *اسم.* ئەنبار؛ ئەمار؛ هەمار؛ هەمبار؛ هەنبار؛ ئەمبار؛ همار؛ هۆمار؛ هومار؛ هامبار؛ ئەمار؛ بارخانە؛ کۆمگە؛ کۆگە؛ مەکۆی کەل‌وپەل.

▣ **انبار پهن:** زڤل؛ سەرانگوێلک؛ سەروانک؛ جێ ڕیخ و شیاکە.

**انبار علوفه:** هافڕدان؛ ئالفدان؛ ئەنباری گیا و تفاق.

**انبار غلّه:** کەوری؛ کواڕ؛ کەنیوە؛ هەماری دەغڵ و دانەوێڵە.

**انبار گلی آذوقه**: کاندۆ؛ کەندۆ؛ کەنوو؛ لۆدە؛ شوێنی گەورەی لە قوڕ چێکراو بۆ دانەوێڵە و ئارد.

**انباری خانه**: ناویس؛ وچخانە؛ خەڵوەتی؛ بنمالی.

▣ **انبار شدن**: ١. لە ئەنباردا کۆوە بوون ٢. تەپە بوون؛ سەریەک کەوتن؛ کەڵەک بوون؛ سەریەک چوون؛ کۆما بەستن؛ قەلاپەچن بوون.

**انبار کردن**: هەمارکردن؛ کۆگادان؛ گلدانەوە لە ئەنبار؛ ڕاگرتنی شتێک.

**انباردار** / 'ambārdār, 'anbār-، ـها؛ ـان/: *اسم*. کۆگەوان؛ هەماردار؛ کەسێک کە هەماری پێ سپێردراوە و حسێبی کەلپەلی ئەوێی لە دەستدایە.

**انبارداری** / 'ambārdārî, 'anbār-/: *اسم*. هومارداری؛ هەمبارداری؛ کۆگەوانی: ١. کار و پیشەی هەمباردار ٢. خەرجی هەمار کردن؛ کرێی هەنبار.

**انبارش** / 'ambāreš, 'anbāreš/: *اسم*. ١. قەلاپەچن؛ قەلاچین؛ قەلاقووچ؛ قەلانقووچ؛ کەڵەکە؛ ڕەوتی گلێرەوە بوون ٢. پەیتاپەیتا هاتنە سەریەک و زۆر بوونەوە یان گلارکردنەوە.

**انبارگردانی**/'ambārgardānî,'anbār-/، ـها/: *اسم*. هەمبارسەنگێنی؛ هەمارنەهێنی؛ همارقەرسێنی؛ تۆژینەوە و لێکدانەوەی بەینابەینی پیتەوای هەمار.

**انباره** / 'ambāre, 'anbāre/: *اسم*. باتری؛ قوە؛ قووەە.

**انباری**[1] / 'ambārî, 'anbārî، ـها/: *اسم*. *[گفتاری]* هەمار؛ هەمباری؛ هومار؛ هەمارەکلە ‹یک انباری کوچک هم در زیر راەپلە داشت: هەمارێکی چکۆلەشی لە ژێر پلەکانەوە هەبوو›.

**انباری**[2] / ـها/: *صفت*. هەمباری؛ هەماری: ١. شیاوی هەڵگرتن لە ناو هەمباردا ‹پیاز انباری: پیوازی هەمباری› ٢. پارێزراو لە ناو عەنباردا ‹کالاهای انباری: کەلپەلی هەمباری›.

**انباز** / 'ambāz, 'anbāz، ـان/: *اسم*. *[ادبی]* هاوکار؛ هاوپشک؛ هەنواز؛ هەڤکار؛ هەمباز؛ هاوبەش؛ ئامباز؛ هەڤتا؛ شەریک؛ دوو یا چەند کەس کە لە کارێکدا پێکەوەن.

▣ **انباز شدن**: هاودەست بوون؛ هاوبەش بوون؛ هەڤیشک بوون.

**انبازی** / 'ambāzî, 'anbāzî، ـها/: *اسم*. *[ادبی]* هاوکاری؛ هاودەستی؛ هاوبەشی؛ هەمبازی؛ شەریکی.

**انباشت** / 'ambāšt, 'anbāšt/: *اسم*. پەچن؛ کۆوەکری؛ کار یان ڕەوتی نیانەیەکەوە؛ پەچنین ‹انباشت سرمایه: پەچنی سەرمایە›.

**انباشتگی** / 'ambāštegî, 'anbāštegî، ـها/: *اسم*. شخل؛ پەچنی؛ قەلاپەچنی؛ پەچنراوی؛ گومەڵتەیی؛ کەڵەکەیی؛ شخلینی؛ قەلاتەیی؛ قەلاچنی؛ دۆخ یان چۆنیەتی قەلاچن بوون.

**انباشتن** / 'ambāštan, 'anbāštan/: *مصدر متعدی*. // **انباشتی**: پەچنیت؛ **می‌انباری**: دەپەچنی؛ **بینبار**: بپەچنە// پەچنین: ١. ئاخنین؛ ئاخنای؛ پوورانْدن؛ پەستاوتن؛ پەستاندن؛ تێپەستاوتن؛ پڕکردن؛ چەپاندن؛ تەپاندن؛ تەپنەی ‹جیب خود را انباشتن: گیرفانی خۆ پەچنین› ٢. قەلاپەچن کردن؛ خۆمین؛ تەپدان؛ شخلین؛ پڕ کردن؛ شەمیتین ‹غله انباشتن: خەلە پەچنین›.

هەروەها: **انباشتنی**

■ صفت فاعلی: **انبارنده** (پەچنیار)/ صفت مفعولی: **انباشته** (پەچنراو)/ مصدر منفی: **نَینباشتن** (نەپەچنین)

**انباشـــته** / 'ambāšte, 'anbāšte/: *صــفت*. ۱. پەچنە؛ گومەڵتە؛ کەڵە؛ کەلار؛ بەسەریەک هاتوو؛ کۆگاکراو؛ قەلاتە؛ قەلاقووچ؛ کەڵەکراو؛ قەلاقووچکە؛ قەلانقووچ؛ قەلانقوچکە؛ هەڵچنراو؛ هەڵچناو؛ کەڵەک؛ لەسەریەک دانراو؛ شخلی؛ قەلاچن ۲. لێوا و لێو؛ لیپاولیپ؛ سەرڕێژ؛ قەلاقەلا؛ تژی؛ پڕ؛ پەڕ.

◘ **انباشته شدن**: کەڵەک بوون؛ قەلاپەچن بوون؛ لە سەر یەک جێگر بوونی زۆر شت.

**انباشته کردن**: خۆمین؛ قەلاپەچن کردن؛ کۆما کردن؛ بەسەر یەکدا کردن؛ پڕ کردن؛ جمکوت کردن؛ ئاخنین؛ تەپاندن؛ چەپانن؛ کۆگا کردن؛ پەڕکەردەی؛ دوسیاندن؛ خەزن‌کردن؛ تەژی‌کرن.

**انبان** / 'ambān, 'anbān/: *اسم*. ـها/: هەنبانە؛ هەمبانە؛ هەمانە؛ هەوانە؛ هەبانە؛ هەڤانە؛ هەمان؛ همبان؛ هەمبان؛ هەبان؛ هەوان؛ هومبان؛ هەنبان؛ هەمیان؛ هەڤان؛ مانە؛ مانێ؛ پێستی گووراوی بزن و مەڕ کە دەیکەنە دەفری شت‌ومەک: **انبانە؛ هَمیان؛ هَمیانە**

**انبانچـــــە** / 'ambānĉe, 'anbānĉe/: *اســم*. هەوانچە؛ هەنبانۆکە.

**انبانە** / 'ambāne, 'anbāne/ ☜ **انبان**

**انبـر** / 'ambor, 'anbor/: *اسم*. ـها/: هەمۆر؛ پەنگر؛ گاز؛ گۆس؛ دووفلێقانە: ۱. ئامرازێکی دوو شاخە بۆ گرتن و هەڵگرتنی شتێک ۲. پلاپیس؛ پۆلووگر؛ پەنگرکێش؛ ئامرازێکی کانزایی بە دوو دەستەی درێژەوە بۆ هەڵگرتنی شتی زۆر داخ ۳. *[گفتاری]* ئامۆردەستی؛ ئەمۆردەسی.

**انبردســـت** / 'ambordast,'anbor-/: *اسم*. ـها/: ئەمۆردەست؛ ئەمۆردەسی؛ ئامرازێکی کارگاییە لە دوو پەل چێ بووە، بۆ گرتنی شت، تەلبڕین، بزمار دەرهێنان و... پەلەکانیشی پتر بە ڕووکێشی لاستیکی داپۆشراوە.

◘ **انبر زغالگیر**: گۆس؛ پەنگر؛ پۆلووگر؛ ماشە؛ مقاش؛ مەقاش؛ کەلبەتان.

**انبـرک** / 'amborak, 'anborak/: *اسم*. ـها/: گازک: ۱. پەنگری چکۆلە؛ گازی چکۆلە؛ مقاش؛ مەقاش ۲. *[جانورشناسی]* قولاف؛ قولاو؛ کەلبەتین؛ ئەندامێکی تایبەت بۆ ڕاوکردن لە بڕێ گیاندارانی جڕدا.

**انبســاط** / 'embesāt, 'enbesāt/: ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم*. ڕەوت و چۆنیەتی بڵاوەو بوون؛ کرانەوە؛ کێش‌هاتن.

◘ **انبساط خاطر**: گەشانەوە؛ ناوچاو کریانەوە؛ ڤەگەشیان.

**انبست** / 'ambast, 'anbast/: *صفت. [نامتداول]* دەڵەمە؛ دۆڵەمە؛ دۆڵەمێ؛ شیری گرتووی هێشتا بە پەنیر نەبووگ.

**انبـــوه**[1] / 'ambûh, 'anbûh/: *اسم*. کۆما؛ پڕایی؛ تەخەک؛ زەمەک؛ گرووپێکی گەورە لە یەک شت ‹انبوه جمعیت: کۆمای خەڵک›.

**انبوه**[2]: *صفت*. پڕ؛ پەڕ: ۱. سنج؛ چڕ؛ زۆر؛ فەراوان ‹گروه انبوه: کۆمەڵی پڕ› ۲. چڕ؛ پۆڕ؛ مشت؛ تەژی؛ نزیک یان هەڵچنیاگ بە سەریەکتردا ‹ریش انبوه؛ جنگل انبوه: ڕدێنی پڕ؛ دارسانی چڕ›.

◘ **انبوه شدن**: کۆبوونەوە؛ خڕبوونەوە؛ چڕ بوون.

**انبوهساز** / 'ambûhsāz, 'anbûh-/: ـها؛ ـان/: *اسم*. ۱. کۆگەساز؛ کۆمەساز؛ ماڵ بە کۆگاساز ۲. کۆمەڵساز؛ کەسێ کە شتێ بە فراوانی دروست دەکا.

**انبوهسازی** / 'ambûhsāzî, 'anbûh-/: ـها/: *اسم*. ۱. ماڵ بە کۆگاسازی ۲. کۆگەسازی؛

کۆمەسازی.

**انبوهه** / 'ambûhe, 'anbûhe/: اسم. کۆمرە؛ کۆمەڵێکی خەڵک یا کەسانی کۆوەبوو لە جێگایەک کە تایبەتمەندی دەستەیی (باری رامیاری؛ ئایینی؛ زمانی؛ رەگەزی...) یان وەک یەک نیە.

**انبوهی** / 'ambûhî, 'anbûhî/: اسم. پڕایی؛ چڕی؛ پۆری؛ ئاپۆرەیی؛ تەژیان؛ مشتی.

**انبه** / 'ambe, 'anbe، ـها/: [هندی] اسم. ئەنبە؛ ئەمبە: ۱. داری ئەمبە؛ دارێکی بەرز و جوانی هەمیشە شینە کە لە شوێنە گەرمەکاندا دەڕوێ ۲. میوەی ئەمبە؛ میوەی ئەو دارە.

**انبیا** / 'ambiyā, 'anbiyā/: [عربی] جمعِ ☜ **نَبی**

**انبیره** / 'ambîre, 'anbîre/: اسم. ئالاش؛ هەلاش؛ هەراش؛ هەلاش؛ کەواشە؛ هەژگ؛ ئالوداران؛ خێزەرە؛ فیزەرە؛ مەردیاق؛ مردیاق؛ مرداق؛ مارتاک؛ گوژیلە؛ گژۆرەک؛ گژویی؛ کژۆڵە؛ دەپ و چربی بان؛ لیشامە؛ گەلازەل؛ زەلە؛ کۆچەک؛ تانە؛ کاشک؛ زەل و تووڵ؛ گەلا و چڵووی سەر دارەڕا.

**انبیق** / 'ambîq, 'anbîq/: [معرب از یونانی] ☜ **نیچه**

**انتحار** / 'entehār، ـها/: [عربی] اسم. [ادبی] خۆکوژی؛ کار و ڕەهاتی خۆکوشتنەوە؛ خۆکوشتن؛ خۆ لە ناو بردن. هەروەها: **انتحار کردن**

**انتحاری** / 'entehārî/: [عربی] صفت. خۆکوژانە ‹عملیات انتحاری: هەڵمەتی خۆکوژانە›.

**انتحال** / 'entehāl/: [عربی] اسم. [نامتداول] دزی وێژەیی؛ کار یان ڕەوتی هەڵبەستنی دەقی ئەدەبی یەکێکی تر بە خۆوە یان بە کەسێکی ترەوە.

**انتخاب** / 'entexāb، ـها؛ ـات/: [عربی] اسم. هەڵبژێری؛ کار یان ڕەوتی نەقان؛ بژاردن؛ هەڵبژاردن؛ گلەوژن؛ هۆرچنیەی؛ وژانن؛ ڤژانن؛ دەستنیشان کردن؛ دیاری کردن، ناو بردن یان جیا کردنەوەی کەسێ یان شتێک لە کۆمەڵەیەکدا ‹انتخاب نماینده: هەڵبژاردنی نوێنەر›.

▣ **انتخاب شدن**: هەڵبژێردران؛ هەڵوژیان.

هەروەها: **انتخاب کردن**

**انتخابات** / 'entexābāt، ـها/: [عربی] اسم. هەڵبژاردن؛ ئینتیخابات؛ هەڵبژاردنی نوێنەر لە دەوڵەتدا.

▣ **انتخابات پارلمانی**: هەڵبژاردنی پەرلەمانی؛ هەڵبژاردنی ئەنجومەنی.

**انتخابات تناسبی**: هەڵبژاردنی چەندیەتی؛ سیستەمێکی هەڵبژاردن لە بڕێک وڵاتانی چەند حیزبیدا کە ژمارەی نوێنەرانی هەر ڕیخراوەیەک بە ڕێژەی دەنگێ کە پێیان دراوە دەستنیشان دەکرێن.

**انتخابات عمومی**: هەڵبژاردنی گشتی؛ هەڵبژاردنێک کە لە سەرتاسەری وڵاتدا بەڕێوە دەچێ.

**انتخابات فرعی** ☜ **انتخابات میان‌دوره‌ای**

**انتخابات میان‌دوره‌ای**: هەڵبژاردنی نێونجی؛ هەڵبژاردنێک کە بۆ پڕکردنەوەی جێگەی خاڵی یەک یان چەند نوێنەر لە ماوەی خولێکی کاردا بەڕێوە دەچێت: **انتخابات فرعی**

**انتخاباتی** / 'entexābātî/: [عربی] صفت. هەڵبژاردەیی؛ هەڵبژاردنی.

**انتخابی** / 'entexābî، ـها/: [عربی] صفت. هەڵبژێردراو ‹نماینده‌ی انتخابی: نوێنەری هەڵبژێردراو›.

**اَنتَر** / 'antar/: [؟] ☜ **عَنتَر**

**انترن** / 'antern، ـها/: [فرانسوی] اسم.

ئەنتێرن؛ خوێندکاری بژیشکی لە ساڵ و نیوی ئاخری خوێندنیدا، کە لە ژێر چاوەدێری مامۆستایان لە نەخۆشخانەدا کار دەکات.

**انترناسیونال** / 'anternās(i)yonāl/: [فرانسوی] *اسم. /سیاست/* نێونەتەوەیی؛ ڕێخراوە یان پێکهاتگەلی نێونەتەوەیی.

**انترناسیونالیست** / 'anternās(i)yonālîst، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* نێونەتەوەخواز ‹مارکسیستها انترناسیونالیست هستند: مارکسیستەکان نێونەتەوەخوازن›.

**انترناسیونالیسم** / 'anternās(i)yonālîsm/: [فرانسوی] *اسم.* نێونەتەوەیی؛ بڕوا بە هەڤگریەتی و هەبوونی قازانجگەلی هاوبەش لە نێوان نەتەوەگەلی جیهاندا ‹انترناسیونالیسم اسلامی: نێونەتەوەیی ئیسلامی›.

**انتزاع** / 'entezā'، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* تەڵبژێری؛ تەڵچنی: ۱. *[نامتداول]* کار یان ڕەوتی جیا کردنەوە؛ لێکردنەوە ۲. *[روان‌شناسی]* پەرژانێکی زەینی کە تێیدا لە کۆمەڵەی دانستەگەلی شتێک، تایبەتمەندییەکی جیاواز لەوانی‌تر سەرنج بدرێ ۳. شێوە یان لایەنێک لە ناسین کە تایبەتمەندی شتێ یا پێوەندی نێوان تایبەتمەندیەکان، بە شێوەی زەینی لە ئەوانی‌تر جیا دەکاتەوە.

◘ **انتزاع کردن:** تەڵچن‌کردن؛ جیا کردنەوە و بە شێوەی جیا‌ـجیا دەرهێنان.

**انتزاعی** / 'entezā'î/: [عربی] *صفت.* جیاواز؛ جیاکار؛ لێ دابڕاو؛ نەبوونی هیچ جۆرە پێوەندیەک لەگەڵ شتێکی‌تر.

**انتساب** / 'entesāb، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. پێوەندایەتی؛ پێوەندی ۲. بار و دۆخی پێوەندیدار بوون.

**انتشار** / 'entešār، ـها/: [عربی] *اسم.* ۱. بڵاوە؛ پەخش؛ کار یان ڕەوتی بڵاو بوونەوە، پەرەسەندن یان بڵاوە کردنی شتێ لە جێگایەکدا ‹انتشار بیماری: بڵاوەی نەخۆشی› ۲. *ـات /[چاپ]* بڵاو کردنەوە؛ کاری چاپ و بڵاوکردنەوەی نووسراوەیەک ‹انتشار کتاب: بڵاوکردنەوەی کتێب›.

◘ **انتشار دادن:** بڵاوکردنەوە. هەروەها: **انتشار داشتن؛ انتشار یافتن**

**انتشارات** / 'entešārāt/: [عربی] *اسم. [چاپ]* دەزگای چاپەمەنی؛ دامەزراوە یان بنکەیەک کە کاری چاپ، بڵاو کردنەوە و دابەش‌کردنی هەر چەشنە نووسراوەیێکە.

**انتشاراتی**[1] / 'entešārātî، ـها/: [عربی] *اسم. [چاپ، گفتاری]* پەخشانگا؛ چاپەمەنی؛ دەزگای چاپ و پەخش ‹انتشاراتی‌ها امروز تعطیل بودند: چاپەمەنیەکان ئەمڕۆ داخرابوون›.

**انتشاراتی**[2]: *صفت. [چاپ]* پەخشانگا؛ چاپەمەنی؛ چاپ و پەخش؛ بەستراو بە ڕەوتی چاپ و پەخشەوە ‹فعالیت انتشاراتی: تێکۆشانی چاپ‌وپەخش›.

**انتصاب** / 'entesāb، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ڕەوتی دانان؛ دامەزراندن؛ کارێک بە کەسێ دان/ ئەسپاردن.

**انتصابی** / 'entesābî/: [عربی] *صفت.* دانراو؛ دانریاگ؛ داندراو ‹مدیر انتصابی: بەڕێوەبەری دانراو›.

**انتظار** / 'entezār، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* نتر؛ چاوەڕوانی؛ چەمەڕایی؛ چاوەنۆڕی؛ چەوەنواڕی؛ نەزاکە؛ تەماداری؛ چاڤنێری؛ ڕێپان؛ تەرنە؛ تەمایەری؛ چاوەنواڕی؛ چاوەنواری؛ چەوچەوی؛ کوترمە؛ ئینتیزار؛ چاوەڕێیی: ۱. کار یان ڕەوتی چاوەڕوان بوون ‹پس از دو ماه انتظار جوابم کردند: دوای دوومانگ چاوەڕوانی جوابیان‌دام› ۲. هیوا

‹انتظارات او را برآورده نکردی: چاوەڕوانییەکانیت نەهێنایە دی›.

▣ **انتظار داشتن:** هیوادار بوون؛ چاوەڕوان بوون؛ چەوەنوور بوون؛ بە هیوا بوون ‹انتظار داشتم کمکم کنی: چاوەڕوان بووم یارمەتیم بدەی›.

**انتظار کشیدن:** چاوەڕوانی کردن؛ نتراندن؛ خایاندن؛ خوەینەی؛ چاوەنۆڕی کردن؛ بە دیار نیشتن؛ سەبر کردن بۆ پێشهاتنی ڕووداوێک ‹چهار ماه انتظار کشیدم تا نامەاش رسید: چوارمانگ چاوەڕوانیم کرد تا نامەکەی گەیشت›.

**در انتظار بودن:** چاوەڕوان بوون؛ چاوەڕوانی کردن؛ چاوەڕێ بوون ‹در انتظارش نباش، نمی‌آید: چاوەڕێی مەبە، نایەت›.

**انتظام** / 'entezām، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ڕێکوپێکی؛ دامەزراوی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی ڕێکوپێک بوون ‹رییس از انتظام مدرسه تعریف کرد: سەرۆک لە ڕێکوپێکی قوتابخانە تاریفی کرد›.

▣ **انتظام دادن:** سامان‌دان؛ ڕێکوپێک کردن؛ پۆڕاندن؛ دامەزراندن.

**انتظامات** / 'entezāmāt/: [عربی]/اسم. ۱. چاوەدێریەتی؛ زێرەڤانی؛ زێرەوانی؛ گرۆ یان بەڕێوەبەرایەتیەک کە کاری پاراستنی هێمنایەتیە ۲. چاوەدێر؛ زێرەڤان؛ زێرەوان؛ ئەو کەسەی کە کاری پاراستنی هێمنایەتی و ڕێک و پێکیە ‹انتظامات مدرسه خوب است: چاوەدێری قوتابخانە باشە›.

**انتظامی** / 'entezāmî/: [عربی] صفت. چاوەدێری؛ زێرەڤانی ‹نیروی انتظامی: هێزی چاوەدێری›.

**انتعاش** / 'ente'āš/: [عربی]/اسم. /ادبی/ کار و ڕەوتی بووژانەوە؛ ژووژانەوە؛ ژیانەوە؛ ژووژیایوە؛ وەکەیف کەوتن لە پاش لەڕی و کەساسی.

**انتفاضه** / 'entefāze/: [عربی]/اسم. ۱. [نامتداول] کار و ڕەوتی تەکاندان؛ لەرزاندنەوە؛ ڕاتڵەکاندن؛ شۆڕکنایوە ۲. ئینتیفازە؛ نێوی ڕاپەڕینی بە بەرد و قەڵماسکی خەڵکی فەلەستین.

**انتفاع** / 'entefā'/: [عربی]/اسم. /ادبی/ بەهرەبەری؛ قازانجبەری ‹از حیّز انتفاع ساقط شد: لە بەهرەبەری کەوت›.

**انتفاعی** / 'enfā'î/: [عربی] صفت. قازانجی؛ بەهرەدەر؛ بەسوود ‹مؤسسەی انتفاعی: دامەزراوەی بەهرەدەر›.

**انتقاد** / 'enteqād، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ڕەخنەگری؛ ڕەخنە: ۱. کار یان ڕەوتی پیشاندانی چاکە و خراپەی شتێک ‹انتقاد کتاب: ڕەخنەی کتێب› ۲. وردەگری؛ خراپەبێژی؛ نکوولی‌وتن ‹انتقاد از بچەها نباید در حضور جمع باشد: ڕەخنەگرتن لە منداڵ نابێ لە ناو خەڵکیدا بێ›.

▣ **انتقاد از خود:** خۆ ڕەخنە؛ ڕەخنەگرتن لە خۆ.

**انتقادآمیز** / 'enteqādāmîz/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕەخنەگرانە؛ ڕەخناوی ‹سخنان انتقادآمیز: قسەگەلی ڕەخنەگرانە›.

**انتقادی** / 'enteqādî/: [عربی] صفت. ڕەخنەگرانە؛ ڕەخنەیی؛ بە ناوەرۆکی ڕەخنەوە ‹مقالەی انتقادی: وتاری ڕەخنەیی›.

**انتقال** / 'enteqāl، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ڕاگوێز؛ گواز؛ کار یان ڕەوتی گۆزیان؛ گۆزەران؛ ڤەگوهاستن؛ ڕاگوێزان؛ گۆزتن؛ گۆزانەوە؛ گوێزانەوە؛ گوێزان؛ گوویزان؛ گوازتنەوە؛ گواستنەوە: ۱. جێبەجێیی؛ جێ‌گۆڕکێ؛ یاگەواڕێ ‹انتقال مسافر: گواستنەوەی مسافر› ۲. گۆڕانی شوێنی

کاری بەڕێوبەر یان کاریگەر ‹انتقال معلمان: گواستنەوەی فێرکاران› ۳. کاری ڕاگەیاندنی پەیام یان هەواڵ ٤. پێدان ‹انتقال ملک: گواستنەوەی مڵک› ٥. *[موسیقی]* گۆڕانی مایەی گۆڕانی ٦. *[جامعەشناسی]* تێپەڕان ‹انتقال از فئودالیسم بە سرمایەداری: تێپەڕان لە دەرەبەگایەتیەوە بەرەو سەرمایەداری›.

◘ **انتقال دادن:** گوهازتن؛ گوازتن؛ ڕاگوێزان؛ گوهاستن؛ هەڵگۆستن؛ ڕاگوێزان؛ گۆزاننەوە؛ گوازتنەوە؛ گۆستنەوە؛ گوازتن؛ گواستن؛ گواستنەوە؛ گۆزاندنەوە؛ گۆزانن؛ جێبەجێ کردن؛ کەسێ یان شتێ لە جێگایێکەوە بۆ جێگایێک بردن. هەروەها: **انتقال یافتن**

**انتقالی** / 'enteqālî، ـها/: [عربی] *صفت.* ۱. ڕاگوێزراو ‹نیروی انتقالی: هێزی ڕاگوێزراو› ۲. ڕاگوێزراوە ‹سند انتقالی: بەڵگەی ڕاگوێزراوە›.

**انتقام** / 'enteqām/: [عربی] *اسم.* تۆڵە؛ تۆڵ؛ حەیف؛ هەیف؛ دۆز؛ وێ ‹انتقام خونین: تۆڵەی خوێنین›.

◘ **انتقام گرفتن:** تۆڵە ساندنەوە؛ تۆڵە کردنەوە؛ حەق ساندنەوە؛ حەیف هەلانین؛ هەیف هەڵێنان؛ هەیف ستاندن؛ تۆڵە ئەستاندنەوە؛ وێ کردنەوە ‹انتقام خون پدرش را گرفت: تۆڵەی خوێنی باوکی ساندەوە›.

**انتقامجو** / 'enteqāmcû، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* تۆڵەئەستێن؛ تۆڵەسێن.

**انتقامجوئی** / 'enteqāmcû'î/: [عربی/ فارسی] ☜ **انتقامجویی**

**انتقامجویانه** / 'enteqāmcûyāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* تۆڵەئەستێنانە؛ تۆڵەسێنانە.

**انتقامجویی** / 'enteqāmcûyî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* تۆڵەسێنی؛ پێ‌نوێنی؛ قین خوازی؛ کار یان ڕەوتی تۆڵەکردنەوە: **انتقامجوئی**

**انتلکتوئل** / 'antelektu'el، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* ڕووناکبیر؛ بیرباز؛ بیرمەند؛ ڕۆشنبیر.

**انتها** / 'entehā/: [عربی] *اسم.* کۆتایی؛ بن؛ دوایی؛ ئاخر؛ ئاکام؛ دوما؛ دوویا؛ دەرئەنجام ‹انتهای راه: کوتایی ڕێگا›.

◘ **بە انتها رسیدن:** دوایی هاتن؛ کۆتایی هاتن؛ دمایی ئامەی؛ دوویا ڕسین؛ گەیشتنە ئاخر.

**انتهائی** / 'entehā'î/: [عربی] ☜ **انتهایی**

**انتهایی** / 'entehāyî/: [عربی] *صفت.* دوایی؛ ئاخری ‹شاخەی انتهایی: لقی دوایی›: **انتهائی**

**انتیم** / 'antîm/: [فرانسوی] *صفت. [گفتاری]* ۱. خۆمانی؛ خۆماڵە ۲. هاوڕێ؛ دۆستی نزیک.

**انجام** / 'ancām/: *اسم.* ۱. ئاکام؛ ئەنجام؛ گا؛ گامە؛ فەساڵ؛ دوایی؛ دوماهی؛ سەر؛ ئاخر. بەرانبەر: **آغاز** ‹آغاز و انجام کار معلوم نبود: سەرەتا و ئاکامی کار ڕوون نەبوو› ۲. ڕەو؛ بەڕێوە بەری؛ شەمیران؛ جێبەجێ؛ کارڕایی ‹انجام دادن: جێبەجێ کردن›.

◙ **انجام وظیفه:** ئەرک بەڕێوەبەری.

◘ **انجام پذیرفتن** ☜ **انجام شدن**

**انجام دادن:** ئەنجامدان؛ پێکهانین؛ پێکئانین؛ مەشاندن؛ کوداندن؛ قەداندن؛ پێکهێنانی کار؛ جێبەجێ کردن؛ بگاردن؛ شەمیراندن؛ بە ئاکام گەیاندنی کار؛ ڕێک هاوردن؛ کاردش؛ ڕواندن؛ سۆغین؛ بەڕێوە بردن؛ بەگا ئاردەی: **بە انجام رساندن**

**انجام شدن:** ڕەنگ گرتن؛ دامەزران و پێکهاتن؛ جێبەجێ بوون؛ پێکهاتنی کار؛ هاتنەکردن؛ ئەنجامدران؛ یەربەیەر بوون؛ سەرگرتن؛ کودان؛ جێبەجێ بوون؛ مەشان؛ شەمیران؛ قەدان؛ بەگا ئامەی؛ بەڕێوەچوون و کۆتایی هاتن: **انجام پذیرفتن؛ انجام گرفتن؛ انجام یافتن؛ بە**

**انجام رسیدن**

**انجام گرفتن** ☜ **انجام شدن**

**انجام یافتن** ☜ **انجام شدن**

**به انجام رساندن** ☜ **انجام دادن**

**به انجام رسیدن** ☜ **انجام شدن**

**انجامیــــدن** / ancāmîdan'/: مـــصدر. لازم. *[ادبی]* //**انجامیـدی**: کۆتاییتهـات؛ **مـی‌انجـامی**: کۆتاییــتدێ؛ **بینجـــام**: کۆتاییــتبــێ// دوایــی هــاتن؛ کۆتــایی هــاتن؛ مــەشــیان؛ شــەمــیران؛ ســۆغیان؛ بــەگــا ئامــەی؛ کــودان؛ مــەشــان؛ قەدان؛ بە ئەنجام گەیشتن و دۆنگی دان.

■ صـفت مفعـولی: **انجامیـــده** (کۆتــاییهــاتوو)/ مصدر منفی: **نَینجامیدن** (کۆتاییـنەهاتن)

**انجبــار** / ancabār'، ـهــا/: [معــرب از فارســی] *اسم.* مــارەوڵــە؛ مێــوژە هــەواری؛ ڕوەکێــک لــە تــیرەی ڕێواســـە کـــە بـــنی لاســـکەکـــەی بـــۆ دەرمان دەشێ: **انگبار**

**انجبین** / ancabîn'/ ☜ **اَنگَبین**

**انجـدان** / ancadān'، ـهــا/: [معــرب از فارســی] *اســم.* قاخـــڵیە بـــەهـــارە؛ شـــەمـــاڵ‌گـــیر؛ بنەگیایـــەکی چەترییـــە کـــە هاوینـــان شـــین دەبــێ و دەوری میتــر و نیوێــک بــالا دەکــا، گوڵـێکی زەردی هەیـە وگـەڵاکانی جەویـەکی بۆن توندیان لێ دەبێتەوە: **انگدان**

**انجره** / ancore'/ ☜ **گَزَنه**

**انجـــم** / ancom'/: [عربــی]*اســم.* ۱. جمــعِ ☜ **نَجـــم** ۲. *[ادبــی]* هـــەســـاران؛ ئـــەســـتێران؛ هەسارەگەل؛ ستارەیەیل؛ هەسارێ.

**انجمـاد** / encemād'، ـها، ـات/: [عربـی]*اسـم.* *[ادبی]* ۱. ڕەوتی ڕچیـان؛ قــەرسـان؛ بــەسـتن؛ قــەڕنانــدن؛ بیــەی؛ قــەرس؛ جــەمــدین؛ بوونــە سەهۆڵ؛ سەهـۆڵ بـەسـتن؛ تونـد بـوونی تـراو لــە تــاوی ســەرما ‹درجــەی انجمــاد: پلــەکــی ڕچیــان› ۲. ســەهــۆڵبــەنـدان؛ بــەســتەڵــەک ‹حالت انجماد: دۆخی بەستەڵەک›.

**انجمـــن** / ancoman'، ـهــا/: *اســم.* کــۆڕ: ۱. لیژنە؛ جوات؛ جـڤات؛ مـەجلیس؛ ئـەنجومـەن؛ کــۆم؛ کۆمــە؛ مــەکــۆ؛ جێگــەی کــۆ بوونــەوەی خەڵک ۲. تاقمــێ کــە بــۆ ڕاپرســی و هــاوبیری لــەبـــارەی دۆزێکـــەوە لـــەو شـــوێنەدا خـــڕ دەبنەوە.

▣ **انجمن ادبی**: کـۆڕی ئـەدەبـێ؛ ئـەنجومـەنی وێژەیی.

**انجمن اولیـا و مربیـان**: ئـەنجومـەنی دایـک و باوکان و مامۆستایان.

**انجمـــن ایـــالتی**: ئـــەنجومـــەنی پارێزگـــاری؛ کۆڕی پارێزگایی.

**انجمن بلدیه**: ئەنجومەنی شار.

**انجمـــن خیریـــه**: کـــۆڕی خێرخـــوازان؛ کۆمەڵـەی چاکـەکـاری. هـەروەهـا: **انجمـن نیکوکاری**

**انجمن ده**: ئەنجومەنی لادێ.

**انجمن سری**: ئەنجومەنی نهێنی.

**انجمن شهر**: ئەنجومەنی شار.

**انجمـــن فیلارمونیـــک**: کـــۆڕی موســـیقا خوازان.

▣ **انجمن شـدن**: *[نامتـداول]* ئـە نجومـەن گـرتن؛ کــۆڕگرتن؛ کــۆڕ بــەســتن؛ کــۆ بوونــەوە لــە جێیەکدا.

**انجمـــن کـــردن**: *[نامتـــداول]* کـــۆڕ دانـــان؛ ئەنجومەن دانان؛ کۆڕگرتن.

**انجمـــن آرا** / ancomanārā'، ـیــان/: صــفت. *[ادبی]* کۆڕگر؛ کۆڕڕازێن: **مجلس‌آرا**

**انجوخ** / ancûx'/: *اسم. [نامتـداول]* چــرچ؛ لــۆچ؛ گـــنج؛ گـــرنج؛ گرنـــژ؛ چـــرچولـــۆچی پێـــست؛ کووریشکی پێست.

**انجوخیـــــــدگی** / ancûxîdegî'/: *اســــم.* *[نامتـــــداول]* چرچـــــی؛ گنجـــــی؛ دۆخ یـــــان چۆنیەتی گرنژینی پێست.

**انجوخیــــــدن** / ancûxîdan'/: مــــصدر. لازم.

*[نامتداول]* چرچان؛ چرچیان؛ چرچیەی؛ لۆچان؛ لۆچیان؛ لۆچیای؛ گنجان؛ گنجیان؛ گرنژین؛ کوریشکان.

**انجوخیده** / ancûxîde'/: *صفت. [نامتداول]* چرچاو؛ لۆچاو؛ گنجاو؛ گرنژاو؛ چرچیاگ؛ سیس و چرچ هەڵگەڕاو.

**انجیدگی** / ancîdegî'/: *اسم.* هەنجنی؛ ئەنجنی؛ هنجی.

**انجیدن** / ancîdan'/: *مصدر. متعدی. [نامتداول]* هەنجنین؛ ئەنجنین؛ ئەنجەنەی؛ ئەنجەنای؛ جنین؛ هەنجاندن: ۱. هەنجن-هەنجن کردن؛ جن-جن کردن؛ ئەنجن-ئەنجن کردن؛ ورد-ورد کردن ۲. پەل-پەل کردن؛ کوت-کوت کردن؛ پرت-پرت کردن؛ پلە-پلێ کەردەی.

**انجیده** / ancîde'/: *صفت. [نامتداول]* ۱. ورد-ورد؛ جن-جن؛ هەنجن-هەنجن؛ ئەنجناو؛ جنیاگ؛ هەنجراو؛ ئەنجنراو؛ ئەنجنیا؛ ئەنجەنیا ۲. پەل-پەل کراو؛ کوت-کوت کراو؛ لەت-لەت کراو؛ وردکراو بە چەقۆ.

**انجیر** / ancîr'، ـها/: *اسم.* هەنجیر؛ هەژیر؛ هژیر؛ هەژیرە؛ هێژیر؛ هنجیر؛ تەفارە: ۱. داری هەنجیر ۲. میوەی ئەو دارە چەند جۆری هەیە بەم ناوانە: درهی؛ هەرکەڤانی؛ هێنانی؛ ڕژیک؛ شنگالی؛ تەفازە؛ زەرک.

◘ **انجیر بنگالی** ☜ **انجیر معابد**

**انجیر کال**: کەڕک؛ هەنجیری کاڵ.

**انجیر کوهی**: تفشک؛ هەژیرە کێوی؛ هەنجیرە کێویلە؛ هەنجیرە کێفیلە.

**انجیر معابد**: هەنجیرە ڕەشە؛ جۆرێ هەنجیری ڕۆژهەڵاتی هێندی، کە بە لای بوودابیەکانەوە پیرۆزە: **انجیر بنگالی**

**انجیرخوار** / ancîrxār'، ـها؛ ـان/: *اسم.* هەنجیرخۆرە؛ هەنجیرەوەرێ؛ مەلێکە لە چەشنی ئایرەمەل، زۆر وازی لە هەنجیرە: **مرغ انجیرخوار**

**انجیلی** / ancîlî'، ـها/: *اسم.* ئاسنەدار؛ ئاسندار؛ دارە ئاسن؛ دارێکی لێرەواری زۆر پتەوە: **آسوندار**

**انچوچک** / ančûčak'، ـها/: *اسم.* ۱. هەرمێ کێویلە؛ هەمرۆکێفیلە؛ هەمرۆ کووجیلە؛ مرۆ کوولە؛ هەمرۆکوچکینە؛ هەمرۆ کووجی ۲. هەجووجەک؛ هەژووژە؛ تۆمی هەمرۆکێوی.

**انحا** / anhā'/: *اسم. [ادبی]* شێوەگەل؛ شێوازگەل؛ شێوێ؛ زێگەل؛ ڕەوتگەل.

◘ **به انحای مختلف**: بە شێوازی جۆراوجۆر؛ بە شێوەگەلی جۆراوجۆر ‹بە انحای مختلف می‌کوشید مرا منصرف کند: بە شێوەگەلی جوراوجور دەیەویست پاشگەزم بکاتەوە›.

**انحراف** / enherāf'، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* چەوتی؛ کلی، هەڵەیی؛ هەڵەکاری؛ کار یان ڕەوتی؛ وەرچەپین؛ لادان؛ کلابوون: ۱. کار یان ڕەوتی لادان؛ جیا یان دوور بوونەوە لە: *الف)* ڕێگای ڕەچاوکراو ‹انحراف قبلە: لادانی رووگە› *ب)* بەرەو لای پێشبینی‌کراو یان بە پێویست دانراو ‹انحراف بە چپ: لادانی بەرەو چەپ› ۲. دۆخ یان چۆنیەتی بەدیهاتوو لە هەرکام لەوانە.

◘ **انحراف اخلاقی**: چەوتی خوو؛ چەوتی خدە؛ هەبوونی خوو و خدەی خراپ (وەک درۆزنی، دزی و...).

**انحراف از راه**: لادان لە ڕێ؛ کلی لە ڕێ.

**انحراف جنسی**: چەوتی جنسی؛ ڕێلایی سێکسی.

**انحراف قبله**: لادانی ڕووگە؛ ڕادەی لاربوونەوەی هەر شوێنێک لە ئاستی قیبلەوە.

**انحراف نور**: لادانی نوور.

**انحرافی** / enherāfî'/: [عربی] *صفت.*

چەوتەبەر: ١. خاوەنی چەوتی ٢. [گفتاری] چەوت؛ کلا ‹افکارِ انحرافی: بیری چەوت›.

**انحصار** / enhesār، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. پاوانی؛ پاوانکاری؛ کار یان ڕەوتی قەدەغە بوون؛ قۆرغ/ قۆرخبوون؛ پاوان کردنی ماڵداریەتی، ماف، سەربەشایەتی یان کەڵپەلێک بۆ کەسێک یان دامەزراوەیێکی دیاری کراو ‹انحصار دولتی: پاوانکاری دەوڵەتی›.

**انحصارات** / enhesārāt/: [عربی]/اسم. دامەزراوگەلێک کە شێوەیەکی چالاکی ئابووریان گرتۆتە ئەستۆوە.

▣ **انحصارات بین‌المللی**: پاوانە نێونەتەوەیەکان؛ پاوانگەلی نێونەتەوەیی.

**انحصارات صنعتی**: پاونگەلی پیشەیی؛ پاوانە پیشەییەکان.

**انحصارطلب** / enhesārtalab، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. پاوانخواز: **انحصارگر**

**انحصارطلبانه** / enhesārtalabāne/: [عربی/ فارسی] صفت. پاوانخوازانە.

**انحصارطلبی** / enhesārtalabî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پاوانخوازی.

**انحصارگر** / enhesārgar/: [عربی/ فارسی] ☜ **انحصارطلب**

**انحصاری** / enhesārî/: [عربی] صفت. پاوانی؛ پاوانکاری؛ پێوەندیدار بە تەنیا کەسێک، دامەزراوەیەک یان گرووپێکی دیاریکراوەوە.

**انحطاط** / enhetāt/: [عربی]/اسم. [ادبی] داهێزاوی؛ دارماوی؛ کار یان ڕەوتی ڕوو بە تەفر و توونا چوون.

**انحلال** / enhelāl/: [عربی]/اسم. ١. کار و ڕەوتی هەڵوەشانەوە؛ هڵشیان؛ هڵشین؛ هەڵەوشینەوە؛ هەڵوەشیان؛ هۆرشیویەی ‹انحلال حزب: هەڵوەشانەوەی حیزب› ٢. [شیمی] توانەوە؛ تاوینەوە؛ ئەوەتاویەی.

**انحنا** / enhenā، ـها/: [عربی]/اسم. چەماوەیی؛ چەماوی؛ چەمیاگی؛ کۆمیاگی؛ چەمیایی ‹انحنای ابرو: چەماوەیی برۆ›.

**انخفاض** / enxefāz/: [عربی]/اسم. [نامتداول] داچەماوی؛ داهاتوویی؛ شۆڕەوەبوویی؛ داکەوتوویی؛ ئەرەکەوتەیی.

**اند** / and/: ضمیر. [ادبی] هێندێک؛ وەند؛ ئەوندە؛ هیند؛ هەن؛ هند؛ ئەند؛ باز؛ چەند؛ چەن؛ چن ‹هزار و اند: هەزار و هێندێک›.

**انداختن** / andāxtan/: مصدر. متعدی. //انداختی: خستت؛ می‌اندازی: دەخەی؛ بیانداز: بخە// خستن: ١. داخستن؛ وسەیرە؛ ئەرەوسەی؛ خستنە خوار ‹لیوان را انداخت: پەرداخەکەی داخست› ٢. هاویشتن؛ ئاویتن؛ هاویژتن؛ هاویتن؛ ئاویشتن؛ هاڤێتن؛ ئاڤێتن؛ خسن؛ برکدان؛ فرێدان؛ شەی؛ شانای؛ شەنەی؛ هاوێژتن ‹تیر انداختن: تیر هاویشتن› ٣. ڕاخستن؛ داخستن؛ یاوایرە؛ وسەیرە ‹قالی را انداخت: قالیەکەی ڕاخست› ٤. داراندنەوە؛ سەرنخوون کردن؛ وەرگێران؛ گلارەو کردن؛ سەرنهۆم کردن؛ هەڵدێران؛ هۆروێڵنەی ‹با پایش سماور را انداخت: بە پا سەماوەرەکەی دارانددەوە› ٥. خستنەجێ؛ دانە جێ؛ وسەینە یاگێ ‹شیشەی پنجره را انداخت: شووشەی پەنجەرەکەی خستەجێ› ٦. بێبەش کردن؛ وسەی ‹از نان خوردن انداختن: لە نان خواردن خستن› ٧. لە جوولە یان کار بێبەش کردن ‹از گردش انداختن: لە گەڕان خستن› ٨. لەبیر کردن؛ لابردن ‹از قلم انداختن: لە ئەژمار خستن› ٩. هێنانە نێو بار و دۆخێکەوە ‹گیر انداختن: وەگیر خستن› ١٠. تەواوکردن ‹از سر و صدا انداختن: لە دەنگ و قاڵ خستن› ١١. وێڵ کردن و لێنەپرسین ‹در گوشەای انداختن: خستنە سووچێکەوە›

١٢. منـاڵ زیـان‌کـردن ‹بچـه را انـداخت: منالـه‌کـه‌ی خـست› ١٣. فـڕێ‌دان؛ فـڕه‌دان؛ دووره‌وکـردن؛ شـه‌مراندن؛ فـڕه‌دای ‹خرت و پرت‌ها را دور انداختیم: خرتکـه و پرتکـه‌کانمامان فـڕی‌دا› ١٤. بـڕین؛ تـێ‌بـڕین؛ ڕوو تـێ‌کـردن ‹نگـاهش را انداختـه بـود تـوی صـورتم: چـاوی بـڕیبووه نـاو چـاوم› ١٥. دانـان یـان دیـاری‌کردن ‹عروسی را انداختند شب جمعـه: زه‌ماوه‌ندەکـه‌یـان خـسته شـه‌وی هـه‌ینـی› ١٦. شـه‌وق خـستنه جێگـه‌یـه‌ک ‹نـور چـراغ را انـداخت تـوی چـشمش: شـه‌وقـی چراکـه‌ی خـسته نـاو چـاوی› ١٧. پـێ‌زیـادکردن؛ دانـه‌دەم ‹بایـد ایـن اتـاق را هـم بینـدازیم سـر سـالن: ده‌بـێ ئـه‌م ژووره‌ش بخـه‌ینـه سـه‌ری میوانخانـه‌وه› ١٨. وێنـه‌ی کـه‌سـێک یان شتێ گرتن یـا لـه شـوێنێک چـاپ کـردن ‹عکسش را انداختـه بودنـد روی جلـد مجلـه: وێنـه‌یان خـستبووه ڕووبـه‌رگی گوڤـاره‌که‌وه› ١٩. فریـودان؛ خاپانـدن؛ لابانـدن ‹کـارش شـده انـداختن بـه مـشتری‌هـای نـاوارد: کـاری بۆتـه فریودانـی کـڕیارانی نابه‌ڵـه‌د› ٢٠. نانـه‌وه؛ گرتنـه‌وه؛ ئـه‌وه‌گێرتـه‌ی ‹سـرکه انـداختن؛ ترشـی انـداختن: سـرکه نانـه‌وه؛ ترشـی گرتنـه‌وه› ٢١. بڕیاردان؛ دانـان ‹عروسـی را انداختنـد شـب جمعـه: زه‌ماوه‌نه‌کـه‌یان خـسته شـه‌وی جومعـه› ٢٢. ڕێگایـه‌ک‌گرتنه‌بـه‌ر؛ بـه شـوێنێکدا چـوون ‹راسـت انـداختیم تـوی اتوبـان: یـه‌ک‌ڕاسـت خـستماند نێـو شـاڕێیانه‌که‌وه› هـه‌روه‌هـا: **انداختنی**

■ صـفت مفعـولی: **انداختـه** (خـراو)/ مـصدر منفـی: **نَینداختن** (نه‌خستن)

ـــ **انـداز** / 'andāz, 'endāz/: *پیـواژه.* ـــخـه‌ر؛ ـ وز: ١. ـ هـاوێژ؛ـ شـان؛ـ شـه‌ن؛ـ ئـه‌ناز؛ تـووڕده‌ر؛ فـڕه‌ده‌ر ‹سـنگانداز: بـه‌ردخـه‌ر› ٢. دانه‌ر له بارێکدا ‹راه‌انداز: ڕێخه‌ر›.

**انـدازه** / 'andāze/ ـهـا/: *اسم.* هـه‌د؛ ئـه‌ندازه؛ ئه‌نازه؛ شۆ؛ قاس؛ هـه‌نـد؛ ڕاده؛ گـۆره؛ گـۆره‌بـا؛ گزاره؛ پێوران؛ پێودانـگ؛ قـه‌در؛ حـه‌د؛ ئـه‌غـد؛ ئاخد؛ ئـه‌قـه‌ده؛ کـه‌وان؛ تـه‌نانـه‌ن؛ هنـد؛ وه‌نـد؛ قـاب؛ قـه‌را؛ قـه‌ر: ١. هـه‌نـدێ کـه بـۆ هه‌ڵسه‌نگاندن تـه‌رخـان کـراوه ‹اندازه‌ی کفش: ئـه‌نـدازه‌ی کـه‌وش› ٢. ئـه‌وه‌ی کـه بـۆ هه‌ڵسه‌نگانـدن بـه کـار ده‌ڕوات ‹اندازه‌ی طول: پیـودانکی درێژایـی› ٣. سـنووری ئاسـایی و وه‌رگیراو ‹در هر کـاری بایـد انـدازه را نگهداشـت: لـه هه‌ر کارێکدا ده‌بێ ڕاده بپارێزرێت›.

▣ **انـدازه بـودن:** بـه ئـه‌نـدازه بـوون؛ بـه قـه‌د بوون؛ ئه‌ندازه بوون؛ پڕبه‌پڕ بوون.

**انـدازه داشـتن:** ئـه‌نـدازه بـوون؛ ئـه‌نـازه‌دار بـوون؛ هـه‌بـوونی ڕاده ‹آخـر خـوش‌بـاوری هـم انـدازه دارد: ئـاخر خـۆش‌بـاوه‌ڕیـش ئـه‌نـدازه‌ی هه‌یه›.

**اندازه زدن:** ئه‌نازه دانـان ‹اندازه‌هـا را بـزن کـه پارچـه را ببـرم: ئـه‌نـازه‌کـان دانـه بـا قوماشـه‌کـه ببرم›.

**اندازه کردن:** ئه‌نازه‌گـرتن ‹اندازه‌کـن ببـین بـه قدت هست؟: ئه‌نـازه‌ی بگـره بزانـه بـه قـه‌دتـه یـا نه؟›.

**انـدازه‌ی کـسی/ چیـزی شـدن:** بـه قـه‌د که‌سێ بـوون ‹اندازه‌ام نبـود، بـردم عـوض کـردم: به‌قه‌دم نه‌بوو، بردم گۆڕیمه‌وه›.

**انـدازه گـرفتن:** پێـوتن؛ پێـوان؛ ئـه‌نـدازه گـرتن؛ وه‌هـه‌نگـاوتن؛ ئـه‌غـدگرتن؛ گـزاره گرتن؛ بەراوردکـردن بـه گـه‌ز یـان بـه کیلـۆ یان به هه‌نگاو ‹طـول اتـاق را اندازه‌گرفتم چهـار متـر بـود: درێـژی ژووره‌کـه‌م پێـوا چـوار میتـر بوو›.

**اندازه نگهداشتن:** ڕاده ڕاگرتن.

**انـــدازه‌شناســـی** / 'andāzešenāsî/ ☜ **سنجه‌شناسی**

**انـدازه‌گـذاری** / 'andāzegozārî/ ـهـا/: *اسم.*

دیاریکردنی پێورانی (وەک درێژایی، پانایی، بەرزایی و قووڵایی).

**اندازه‌گیر** / andāzegîr'/: اسم. پێوەر؛ ئەندازەگر؛ لەگەزدەر؛ کەسێ کە شتێک دەپێوێ.

**اندازه‌گیری** / andāzegîrî'، ـها/: اسم. پێوان؛ پێوەری؛ هەڵسەنگاندن؛ کار یان ڕەوتی دیاری کردنی ئەندازەی شتێک بە یەکەیێکی ئەندازەگیری.

**ـــ اندازی** / andāzî, 'endāzî'، ـها/: پیواژه. ـخەری؛ ـ وسەی؛ خستن؛ کار یان ڕەوتی: *الف)* هاویشتن؛ شانەی ‹سنگ‌اندازی: بەردخستن› *ب)* دانان؛ بەڕێوە بردن ‹راه‌اندازی: ڕێخستن›.

**اندام** / andām'، ـها/: اسم. ئەندام؛ هەندام؛ ئەنام: ١. بەشێ لە لەشی زیندەوەر کە کارێکی تایبەت ئەنجام دەدات ‹اندام بینایی: ئەندامی دیتن› ٢. بەژن؛ پەیکەر؛ گۆدە؛ گۆڤدە؛ کەلەخ؛ کەلەستە؛ گەت ‹خوش اندام: بەژن ڕێک›.

▣ **اندام تناسلی**: ئەندامی زا و زێ؛ ئەو بەشە لە لەشی گیان‌لەبەران (نێر و مێ) کە لە جووت بوونیاندا بەشداری دەکا: **دستگاه تناسلی**

**اندامگان** / andāmgān'/: اسم. زیندەبەر؛ زینەوەر.

**انداوه** / andāve'/: اسم. هێلەساو؛ هێلەساوە؛ لیسە؛ مالنج؛ سیرەکۆلێ؛ ماڵەی بەردین بۆ سواغ.

**اندر**[1] / andar'/: حرف. *[ادبی]* تێ؛ لە؛ جە؛ ژ؛ دە؛ نە؛ لەنێو؛ لەناو؛ دەنێو؛ دلێو؛ هوندر؛ ژناڤدا؛ لەتۆی.

▣ **اندر آمدن**: هاتنە دەر؛ دەرهاتن؛ دەرکەوتن؛ بەرئامەی.

**اندر شدن**: چوونەناو؛ چوونە ژوور؛ لوەی دلێ؛ لوەی چوەر.

**ـــ اندر**[2]: پیواژه. زڕـ ؛ـ هەلەک ‹پدراندر: زرباوک›.

**اندرز** / andarz'، ـها/: اسم. ئامۆژگاری؛ مۆژگاری؛ مۆجگاری؛ مۆجیاری؛ مۆچیاری؛ مۆژیاری؛ مۆج؛ پەند؛ نەسیحەت.

▣ **اندرز دادن**: ئامۆژگاری کردن؛ مۆچیاری کردن.

**اندرز گرفتن**: ئامۆژگاری وەرگرتن.

**اندرزگاه** / andarzgāh'، ـها/: اسم. ڕاوێژگا؛ دامەزراوەیەک بە مەبەستی ڕێنوێنی کردن لە بوارگەلی بژیشکی، تەندروستی و ڕەوانی.

**اندرزگو** / andarzgû'، ـها؛ ـیان/: اسم. ئامۆژگار؛ ئامۆژیار؛ مۆچیار؛ پەندێر؛ ئامۆژگاریکەر؛ مۆژیار؛ مۆچکە؛ ئامۆچیار؛ ئامۆژگاری کار؛ ڕاوێژکەر؛ مۆچیاریکەر؛ نەسیحەت کەر.

**اندرزگویی** / andarzgûyî'/: اسم. مۆچیاری؛ ئامۆژگاری؛ ئامۆژیاری.

**اندرزنامه** / andarznāme'، ـها/: اسم. ئامۆژگاری‌نامە؛ مۆچیاری‌نامە؛ پەندنامە؛ ڕاوێژنامە؛ کتێب یان نووسراوەیەک کە خوێنەرەکەی بە کاری باش ئامۆژگاری دەکات.

**اندرکنش** / andarkoneš'/ ☜ **برهمکنش**

**اندرون** / andarûn'، ـها/: اسم. *[ادبی]* هوندر؛ هندروو؛ هوندروو: ١. ناوەوە؛ دلێ؛ چوەر؛ بەشی دەروونی هەر شتێک ‹اندرون خانە: ناوەوەی ماڵ› ٢. *[قدیمی]* کۆسەر؛ بەشی پشتەوەی ماڵەگەورەگەل کە تایبەتی ژن و خێزان بوو ٣. دەروون؛ ناخ؛ هەناو ‹در اندرون من خستەدل ندانم چیست: منی دلمەن دەروونم چی و چ باسە؟ مات و حەیرانم›.

**اندرونه** / andarûne'/: اسم. *[کالبدشناسی]*

ئه‌شقه‌مه؛ ورگ؛ ناوسک؛ ناوزگ؛ ئه‌ندامانی ناوزگ؛ هه‌ناو (وه‌کوو: ڕیخۆڵه، گورچیله، جه‌رگ و...).

**اندرونه‌شناسی** / andarûnešenāsî'/: اسم. [پزشکی] هه‌ناوناسی؛ زانستی تاوتوێ کردنی نه‌خۆشینه‌کانی ناو سک.

**اندرونی** [1] / andarûnî'، ـها/: اسم. هندرو؛ ئه‌نده‌روون؛ هۆندروو؛ کۆسه‌ر؛ ژووری ماڵه‌وه؛ خانووی پشته‌وه؛ جێگای ژن و منالی پیاوی گه‌وره.

**اندرونی** [2]: صفت. ده‌روونی؛ ناوه‌کی؛ ناوه‌وه‌یی ‹بخش اندرونی: به‌شی ده‌روونی›.

**اندک** [1] / andak'/: صفت. [ادبی] که‌م؛ کێم؛ کیم؛ کم؛ کمووکه؛ که‌مووکه؛ که‌مووسکه؛ تۆزکاڵ؛ تۆزقاڵ؛ تۆزولکه؛ هندک؛ هه‌ندک؛ هنده‌که‌م؛ هێند؛ نچه؛ سووکه‌ڵه؛ پیچ؛ پێزه؛ په‌رچق؛ ورده؛ پیت؛ بروسک؛ ئاسته‌م؛ قیچ؛ وله‌ق؛ قل؛ کاژ؛ گه‌رد؛ تووک؛ پرک؛ پیچه‌ک؛ پرتک؛ چینچک ‹کار اندک: کاری که‌م›.

**اندک** [2]: قید. کورته؛ که‌مه؛ نه‌خته؛ تۆسقاڵه؛ هه‌ندک؛ پیچه‌ک؛ به‌حاڵ ‹اندک زمانی خوابید: کورته ماوه‌یه‌ک نووست›.

▣ **اندک‌اندک**: نه‌خته‌ـ نه‌خته؛ که‌مـ‌که‌م؛ پیته‌ـ‌پیته؛ که‌مه‌ـ‌که‌مه؛ تۆزه‌ـ‌تۆزه؛ کێم‌ـ‌کێم؛ چکه‌ـ‌چکه؛ پیچ‌ـ‌پیچ؛ ڕێزه‌ـ‌ڕێزه؛ پچڕ‌ـ‌پچڕ؛ پیچ‌ـ‌پیچه؛ کوچه‌ـ‌کوچه؛ کوچله‌ـ‌کوچله؛ هندک‌ـ‌هندک ‹اندک‌ـ اندک کارش بالا گرفت: نه‌خته‌ـ نه‌خته کاره‌که‌ی به‌رزه‌وه بوو›.

**اندک‌بین** / andakbîn'، ـها؛ ـان/: صفت. ۱. به‌رچاوته‌نگ ۲. بیرکورت.

**اندکس** / andeks'، ـها/: اسم. پێرست: **اندیکس**

**اندکی** [1] / andakî'/: اسم. [ادبی] چه‌نێ؛ هێندێ؛ هه‌ندێک؛ هندکه‌ک؛ هێندێک؛ هه‌نده‌ک؛ هه‌ندێ؛ هه‌نکێ؛ هێندگۆکه؛ هن؛ هه‌نی؛ که‌مێک؛ تۆزێک؛ دالێو؛ دنێو؛ کوچێو؛ چکێ؛ که‌مێ؛ هه‌لیه؛ قلێک؛ تۆزقاڵێک؛ تۆزکاڵێک؛ که‌مووسکه‌یه‌ک؛ قنجک؛ پیچک؛ پیچه‌ک؛ هه‌به‌ک؛ نیسکێک؛ کوتک؛ پاژێکی که‌م؛ بازێک؛ تانێ؛ که‌مه‌ک؛ پیچه‌ک؛ بڕێ؛ نه‌ختێک؛ نه‌ختێ؛ که‌موکه‌یێ؛ چکێ؛ تۆزێ؛ میچاله‌ک؛ ڕیزه‌یه‌ک؛ چکێک؛ برووکه؛ پیچه‌ک؛ دۆخ یا چۆناوچۆنی هندک بوون.

**اندکی** [2]: صفت. [ادبی] تۆزێ؛ نه‌ختێ؛ که‌مێک؛ هه‌ندێ؛ چکێ؛ تۆزقالێ؛ کوچێو؛ دالێو ‹آب اندکی در رودخانه جاری بود: تۆزێ ئاو به رووباره‌که‌دا ده‌ڕۆیشت›.

**اندکی** [3]: قید. [ادبی] تۆزێک؛ تۆزقالێ؛ چکێ؛ چکێک؛ نه‌ختێک؛ که‌مێک؛ هه‌ندێک؛ کوچێو؛ کوچلانجلێو؛ کوچلالێو؛ کوچالێو ‹اندکی خوردم: تۆزێکم خوارد›.

**اندکی** [4]: ضمیر. [ادبی] بڕێک؛ هێندێک؛ هه‌ندێک؛ که‌مێک ‹اندکی ماندند، عده‌ای هم رفتند: بڕێک مانه‌وه‌و هێندێکیش چوون›.

**اندماغ** / andamāq'/: اسم. ۱. [مستهجن] که‌مێڵه؛ ئه‌وه‌ی له وشک بوونه‌وه‌ی چڵم له ناو لووتدا ده‌مێنێته‌وه ۲. لووتگه‌نیوی؛ لووتگولی ✱ **عن‌دماغ**

**اندوختن** / andûxtan'/: مصدر. متعدی. [ادبی] //**اندوختی**: کۆت کرده‌وه؛ **می‌اندوزی**: کۆ ده‌که‌یه‌وه؛ **بیندوز**: کۆکه‌ره‌وه// کۆکردنه‌وه؛ پاشه‌قل‌دان؛ نیانه‌یه‌که‌وه؛ هه‌نۆتن؛ خڕقه‌کرن؛ کۆمکرن؛ جه‌ماندن؛ قه‌بوورین؛ گێڕانه‌وه؛ پاش خستن؛ نیایوه وریو؛ پاشه‌ناز کردن. هه‌روه‌ها: **اندوختنی**

■ صفت مفعولی: **اندوخته** (کۆوه‌کراو)/ مصدر

منفی: نَیَندوختن (کۆ نەکردنەوە)

**اندوخته** / andûxte'، ـها/:اسم. پاشکەوت؛ پاشەکەفت؛ پاشمەنە؛ پەزمەندە؛ پەسمەندە؛ پەسمەنە؛ پەزەمەنە؛ گردەوەکۆیی؛ نیاتە؛ ڤەبوور؛ ئەوەی کۆ کرابێتەوە.

◫ **اندوختەی قانونی**: پاشکەوتی قانوونی؛ پارەیەک کە هەر بانکێ دەبێ وەکوو ئەمانەت بیدا بە بانکی ناوەندی.

**اندود**[1] / andûd'، ـها/:اسم. هەن؛ سواخ؛ هەندۆ؛ کفت؛ ئاویە؛ ئەناو؛ ئەنوو؛ ئەنوود؛ کاگڵ، گەچ، چیمەنتوو و... کە وەکوو پۆشتێ دەیماڵنە ڕووی بان و دیوارەوە.

◫ **اندود کردن**: هەڵسوان؛ هەڵسوون؛ هەسوون؛ هەسوین؛ ناوین؛ ناوینەوە؛ ناوەی؛ ساوەی.

ـــ **اندود**[2]: پیواژە. ـکفت؛ـهن؛ هەندۆ؛ ـئەنوو؛ـسواخ؛ـساو؛ـناو ‹زراندود: زێڕکفت›.

**اندودکاری** / andûdkārî'، ـها/:اسم. سواخکاری هەندۆکاری؛ کار و ڕەوتی هەڵسوان؛ ناوینەوە؛ سواخدان.

**اندودن** / andûdan'/: مصدر. متعدی. //اندود کردی: ناویتەوە؛ اندود می‌کنی: دەناویەوە؛ اندود کن: بناوەوە// هەنین؛ هەنوون؛ ناوین؛ تێهەڵسوون؛ تێهەڵساوین؛ پیاماڵین؛ هێسوون؛ تێدان؛ سواخدان؛ پیاساوین؛ ساوین؛ سواق دەی؛ ناوەی؛ ناوای؛ هەڵسوون. هەروەها: **اندودنی**

■ مصدر منفی: نَیَندودن (نەناوینەوە)

ـــ **اندوز** / andûz'، ـها؛ ـان/: پیواژە. ـکۆکەر؛ ـخڕکەر؛ ـگێڕەوە؛ ـجەمێن؛ خڕکەرەوە ‹مال اندوز: ماڵ کۆکەر›.

**اندوه** / andûh'، ـان/:اسم. مۆژە؛ خەم؛ غەم؛ خەفەت؛ تەمیان؛ خەمگینی؛ جخار؛ جەخار؛ مەینەت؛ کەسەر؛ کوڵ؛ گژم؛ کۆڤان؛ ئەندۆ؛ پەژارە؛ خوسە؛ مووروز؛ ئەنۆ؛ تانۆت؛ ئالوز؛ حەژمەت؛ پەرێشانی بە هۆی لە دەس‌دانی کەسێک یان شتێکەوە یان لەبەر ناڕەحەتی و ناهومێدی ‹اندوه از دست دادن فرزند: خەمی لە دەس‌دانی منداڵ›: **اندُه**

◫ **اندوه خوردن**: خەفەت خواردن؛ تووشی پەژارە هاتن ‹اندوه روزهای گذشته را می‌خورد: **خەفەتی** ڕۆژانی ڕابردوو **دەخوا**›.

**اندوه‌آور** / andûhāvar'/ ☜ **اندوهزا**

**اندوهبار** / andûhbār'/ ☜ **اندوهزا**

**اندوهخوار** / andûhxār'/: صفت. [ادبی] ۱. [نامتداول] خەمبار؛ خەفەتبار ۲. ـها؛ ـان/ خەمخۆر ‹او یگانه اندوهخوار همسر خود بود: ئەو تاقە خەمخۆری هاوسەرەکەی بوو› *اندوهگسار

**اندوهزا** / andûhzā'/: صفت. خەمهێنەر؛ خەمێنەر؛ پەژارەدەر؛ خەمخێز؛ خاوەن تایبەتمەندی بەدی هێنانی خەفەت: **اندوه‌آور؛ اندوهبار**

**اندوه‌زدا** / andûhzedā'، ـیان/:صفت. خەمڕەوێن؛ خەفەتبەر؛ جەخاربەر؛ خاوەن تایبەتمەندی لابردنی خەفەت.

**اندوهگسار** / andûhgosār'/ ☜ **اندوهخوار-۲**

**اندوهگین** / andûhgîn'، ـان/: صفت. [ادبی] پەرۆش؛ دڵ پەشێو؛ گرتە؛ پەژارەمەند؛ جەرگاوس؛ دڵپڕلەخەم؛ داخدار؛ خەمبار؛ خەفەتبار؛ دڵتەنگ؛ مرووچ؛ مرووز؛ گرتە؛ دڵ بەخەم؛ غەمگین؛ خەمین؛ خەمناک ‹وقتی وارد مدرسه شد چهره‌ای پریشان و اندوهگین داشت: کاتێ چووە قوتابخانەوە دیمەنێکی پەرێشان و پەرۆشی بوو›: **اندوهناک**

**اندوهگینی** / andûhgînî'/:اسم. خەمباری؛ خەمینی؛ دڵتەنگی؛ پەژارەمەندی؛ بار یا دۆخی خەمگین بوون.

**اندوهناک** / andûhnāk'/ ☜ **اندوهگین**

**انـــده** / andoh'/: اسـم. [مخفف، ادبی] گـژم؛ خەم؛ جەخار؛ کۆڤان: **اندوه**

**انـــدیش**ـــ / andîš'/: پیشـواژە. بیرـ ؛ ویرـ ؛ هزر ؛ ئەندێشـ ؛ هشـ ‹اندیشمند: بیرمەند›.

**ـ اندیش**: پیواژە. ـ نـوار؛ ـ ڕوان؛ ـ ئـەنـدێش؛ ـ هشێن ‹دوراندیش: دوورنوار›.

**اندیـــشمند** / andîšmand'، ـــان/: صـــفت. خـاوەن هـزر؛ بیرمـەنـد: ١. بـیرەوەر؛ خـاوەن توانـایی بیرکردنـەوە بـەتایبـەت بـەشـێوەی هـەمـەلایـەن و بـەڵـگەیـی (وەک: لـە بابـەتی زانستی، سیاسـی و فـەلـسەفی) ٢. خـاوەن بـیر و چارەگەلی باش و بەبایەخ.

**اندیـــشناک** / andîšnāk'/: صـــفت. [ادبـــی] پەرێشان؛ پەرۆش؛ شەوشان.

**اندیـــشه** / andîše' ، ـــهـــا/: اسـم. [ادبـی] ١. ئـەندێـشه؛ هـزر؛ بـیر ٢. [مجـازی] تـرس؛ نیگەرانی؛ دڵەڕاوکێ.

⊡ اندیـــشه کـــردن: ١. نیگـــەران بـــوون ٢. تـێڕامـان؛ تێفکـرین؛ هـشاندن. هـەروەهـا: **در اندیشه بودن**

در اندیشهٔ کاری بـودن: لـە بـیری کارێکـدا بوون: ١. تێفکـرین سـەبـارەت بـە کـارێ ٢. پەیجۆری کارێک بوون.

**اندیـشه کـار** / andîšekār' ، ـان/: اسم. بیرکـار؛ کـەسـێ کـە کـاری هاوڕێیـە لـەگـەڵ کـەڵـک وەرگـرتن لـە توانـایی زەینیـدا (وەک هێـزی داهێنان، بەڵگەهێنانەوە و بەراورد و...).

**اندیـــشیدن** / andîšîdan'/: مـــصدر. لازم. //**اندیـــشیدی**: بـیرت کـردەوە؛ **مـــی اندیـــشی**: بـــیردەکـــەیـــەوە؛ **بینـــدیش**: بیرکـــەوە// ١. بـــیرکردنـــەوە؛ تێـــڕامان؛ تیاڕامـــان؛ هـــشاندن؛ ویـــرەوەکـــەردەی ٢. ☜ **اندیـــشه کـــردن**. هەروەها: **اندیشیدنی**

■ صـفت مفعـولی: **اندیـشیده** (بـیرلـێکـراوە) / مصدر منفی: **نیَندیشیدن** (بیر نەکردنەوە)

**اندیـــشیده** / andîšîde'/: صـــفت. ژیرانـــە؛ گونجـاو؛ هـەڵـسەنگێنـراو؛ پوختـە؛ پوخـت ‹رفتار اندیشیده: ئاکاری گونجاو›.

**انـــدیکاتور** / andîkātor'/: [فرانـسوی] ☜ دفتر اندیکاتور، **دفتر**

**انـــدیکاتورنویس** / andîkātornevîs'، ـــهـــا، ـان/: اسم. ئـەنـدیکاتورنووس؛ کارمـەنـدێک کـە کاری نووسینی پەڕاوی ئەندیکاتورە.

**انـــدیکس** / andîks'، ـــهـــا/: [از فرانسوی] اسم. ١. شێوازێکی ئـە نـدیکاتور نووسـی ٢. پێڕست؛ ئەندکس ٣. ☜ **انگشتی[١]ـ ٣**

**اندیویدوآلیـــست** / andîvîdûālîst'، ـــهـــا/: [فرانسوی] صفت. تاکەخواز؛ تاکەوگر.

**اندیویدوآلیـــــسم** / andîvîdûālîsm'/: [فرانـسوی] اسـم. تاکـەخـوازی؛ تاکـەوگـری؛ کەس پەرستی.

**انـــرژی** / enerjî'/: [فرانـسوی] اسـم. وزە؛ هێـز؛ توانا؛ ئاز؛ هازی.

**انرژیـــزا** / enerjîzā' ، ـــهـــا/: [فرانسوی/ فارسی] صفت. وزەزا؛ وزەزن.

**انـــزال** / enzāl'/: [عربـــی] اسـم. کـــاژێری؛ ڕەحەت بوون؛ برێتی لە ئاو هاتنەوە.

**انزجـــار** / enzecār'/: [عربـی] اسـم. ڕق؛ قـین؛ گـرخ؛ بێـزاری ‹سـخنانش موجـب انزجـار حاضـران شد: قسەکانی بوو بە هۆی ڕقی دانیشتوان›.

**انـــزروت** / anzarût'/: اسـم. گـــوژە؛ عـەنـزەرووت؛ کـووژەرە؛ ئـەنـزەرووت؛ شـیلەی تالی بـڕێ لـە دارچـک و دەوەن گـەلی بیاوانی بـە ڕەنگـی سـوور یـان زەرد کـە زۆربـەیـان بـۆ دەرمان ئەشێن.

**انـــزوا** / enzevā'/: [عربـی] اسم. گۆشـەگـری؛ کـونجنـشینی؛ دوورەپـەرێـزی؛ سـلکان؛ دوورە پەرێزی لە خەڵک.

**انزواطلبـــی** / enzevātalabî'، ـــهـــا/: [عربـی]

/اسم. دووره‌په‌ریزخوازی؛ کوژیخوازی؛ هۆگره‌تی به که‌نارگرتن و جیایی له دیتران.

**انژیولژی** / 'anjiyolojî/ ☜ **آنژیولژی**

**انس** / 'ens/: [عربی]/اسم. [ادبی] مروڤ؛ مرۆ؛ مروو؛ ئایەم؛ بنیادەم.

**انس** / 'ons/: [عربی]/اسم. ١. هۆ؛ خوو؛ عادەت؛ هۆگری؛ هیروو؛ هەڤبەندی؛ هەستی دۆستایەتی و خۆشەویستی بە هۆی هاونشینی یان کەین و بەینی زۆرەوە ٢. ☜ **اُونس**

⊡ **انس گرفتن**: خوو پێگرتن؛ خووگرتن؛ هۆگر بوون؛ هوکارە بوون؛ وەنسە؛ عادەت کردن؛ خێ‌گرتن؛ خۆگرتن؛ خدێ‌گرتن؛ هروگرتن؛ گرۆ بوون ‹بزودی با بچه‌ها انس گرفت: خێرا لەگەڵ منداڵەکاندا هۆگربوو›.

**انساب** / 'ansāb/: [عربی] جمعِ ☜ **نَسَب**

**انساج** / 'ansāc/: [عربی] جمعِ ☜ **نَسج**

**انسان** / 'ensān، ـها/: [عربی]/اسم. ١. مرۆ؛ مرۆڤ؛ مەری؛ مەروو؛ مهۆ؛ بنیادەم؛ بەشەر؛ ئینسان ٢. [مجازی] مرۆی چاک و پاک ‹معلم ما یک انسان واقعی بود: مامۆستاکەی ئێمە مرۆڤێکی ڕاستە قینە بوو› ٣. پیاو؛ پیاگ؛ کەس؛ تاک ‹در چنین وضعی انسان تکلیفش چیست؟: لە وەها دۆخێکدا پیاو چی بکات؟›

*آدم؛ آدمی

⊡ **انسان بودن**: ئینسان بوون؛ چاک و پاک بوون. هەروەها: **انسان شدن**

**انسان‌خدایی** / 'ensānxodāyî/: [عربی/فارسی]/اسم. خودامرۆڤی؛ ڕوانگەیەکی فەلسەفی کە خودا لە باری شێوە و سیماوە وەک مرۆڤ دەزانێ.

**انسان‌دوستی** / 'ensāndûstî/: [عربی/فارسی]/اسم. مرۆدۆستی؛ مرۆڤدۆستی؛ خۆش‌گەرەک بوونی مرۆڤ و یارمەتیدانی و هاودەردی‌کردن لە گەڵیدا و تەقالا دان بۆ خۆشحاڵ و خۆشبەخت‌کردنی. هەروەها: **انسان‌دوست**

**انسان‌ریخت** / 'ensānrîxt، ـها/: [عربی/فارسی]/اسم. مرۆڤنوێن؛ مرۆڕێت.

**انسان‌ریختی** / 'ensānrîxtî/: [عربی/فارسی]/اسم. مرۆڤنوێنی؛ مرۆڕێتی؛ وەک مرۆڤ نواندنی بوونەوەران و بڕێک لە تایبەتمەندیگەلی مرۆڤانە پێدانیان، لە چیرۆک و نومایش و...

**انسان‌ساخت** / 'ensānsāxt/: [عربی/فارسی] صفت. دەستکرد؛ مرۆڤکرد؛ دروستکراو بە دەستی مرۆڤ یان بەدیهاتوو بە هۆی چالاکیەکانی مرۆڤەوە.

**انسان‌ساز** / 'ensānsāz/: [عربی/فارسی] صفت. مرۆپەروەر؛ هۆ یان هۆکاری پەروەرشتی (دەروونی) مرۆڤ.

**انسان‌سازی** / 'ensānsāzî، ـها/: [عربی/فارسی]/اسم. مرۆسازی؛ کار یان ڕەوتی ڕاهێنان و بووژاندنەوەی بایەخە مەعنەویەکانی مرۆڤ.

**انسان‌شناسی** / 'ensānšenāsî/: [عربی/فارسی]/اسم. مرۆڤناسی؛ زانستی ناسین و ناسینەوەی نەژادگەلی مرۆڤ و کۆمەڵگەگەلی مرۆڤی، بەتایبەت لە باری پەرتەوازەیی و سەرچاوە و پێوەندی ڕەگەزگەل لەگەڵ یەکتردا: **قوم‌شناسی؛ نژادشناسی**

**انسان‌گرایی** / 'ensāngerāyî/: [عربی/فارسی]/اسم. مرۆڤەوگری؛ مرۆڤخوازی؛ ئومانیسم: ١. هەر چەشنە بنەمای کردەوەیی یان فیکریەک‌کە تەنیا بیر لە قازانجی مرۆڤ دەکاتەوە ٢. لایەنگری لە بیر و بۆچوونگەلێک کە دەبنە هۆی پەرەسەندنی فەرهەنگی مرۆڤایەتی. هەروەها: **انسانگرا**

**انسان‌مداری** / ensānmadārî'/: [عربی]/اسم. ١. ئامۆژەیەک کە جیهان بە پێی بایەخ و ئەزموونگەلی مرۆڤ ڕاژە و ڕاڤە دەکا ٢. ئامۆژەیەک کە مرۆڤ بە گرنگترین دیاردەی جیهان دەزانێ. هەروەها: **انسان‌مدار**

**انسانها** / ensānhā'/: [عربی/ فارسی]/اسم. مرۆڤان؛ مرۆڤگەل؛ ئینسانگەل؛ پێگەیشتووترین گیانلەبەر لە تیرەی ئینسانگەل کە بریتین لە مرۆڤی ئیمرۆژینە و باب و کالانی کە دەوروبەری ٤،٥ ملیۆن ساڵ لەمەوپێش لە سەر زەویەوە پەیدا بوون، مێشکی گەورە و چەناگەی کورتیان هەیە و دان و هاروویان لە ڕیزێکدا جێیان گرتووە، دەست و پێیان تەواو لێک جیاوازە و پایان لە دەستیان درێژترە و قامکی پایان کورت بۆتەوە.

**انسانی** / ensānî'/: [عربی] *صفت*. مرۆڤانە؛ ئینسانی: ١. پێوەندیدار یان بەستراو بە مرۆڤەوە ‹اندیشه‌های انسانی: بیر و ڕای مرۆڤانە› ٢. شایان؛ لەبار بۆ مرۆڤ ‹رفتار انسانی: ئاکاری مرۆڤانە›.

**انسانیت** / ensānîyyat'/: [عربی]/اسم. مرۆڤایەتی؛ مرۆڤاتی؛ پیاوەتی؛ مەردایەتی؛ مرۆڤانی؛ ئینسانەتی؛ جوامێری: ١. دۆخ یان چۆنیەتی مرۆڤ بوون. بەرانبەر: **حیوانیت** ٢. ئاکار و کردەوەی مرۆڤانی ‹انسانیت سرش نمی‌شود: مانای مرۆڤایەتی نازانێ›.

**انسب** / ansab'/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* لەبارتر؛ شیاوتر؛ شایانتر.

**انستیتو** / anstîto, 'anstîtû'/، ـها/: [فرانسوی] /اسم. ئەنستیتۆ: ١. بنکە ٢. بنکەی زانستی ٣. بەڕێوەبەرایەتی فێرکاری زانستی.

**انسجام** / ensecām'/: [عربی]/اسم. ١. یەکپارچەیی ٢. پاوەجێیی؛ ڕاوەستاوی.

⊡ **انسجام لفظ**: یەکانگیری وتە؛ پتەوی قسە.

⊡ **انسجام پذیرفتن**: یەکانگیر بوون؛ پتەو بوون.

**انسداد** / ensedād'/، ـها/: [عربی]/اسم. گیراوی: ١. *[نامتداول]* بەستراوی؛ گیریاگی؛ گیریاوی ٢. *[پزشکی]* ڕەوتی تەنگ بوونەوە یا گیرانی ڕیخۆڵە و دەمار و... ‹انسداد روده: گیرانی ڕیخۆڵە›.

**انسیکلوپدی** / ansîklopedî'/، ـها/: [از فرانسوی]/اسم. فەرهەنگی بەرفراوان؛ کەشکۆڵی زانیاری: **دایره‌المعارف**

**انسیکلوپدیست** / ansîklopedîst'/، ـها/: [از فرانسوی]/اسم. ١. نووسەری فەرهەنگی بەرفراوان ٢. زۆرزان؛ پیتۆڵ.

**انشا** / enšā'/: [عربی]/اسم. ١. *[قدیمی]* نووسەری ‹در دربار امیر بدرخان منصب انشا داشت: لە بارگەی میر بەدرخاندا لە سەر کورسی نووسەری بوو› ٢. /ـها/ ئینشا؛ نووسین؛ پەیدا کردنی وشەو ڕستەی گونجاو بۆ نووسین.

**انشاءالله** / enšā'allāh'/: [عربی] *دعا*. ئیشەڵلا: ١. خوا حەزکا؛ خوا بیکا؛ هوومای بکۆ؛ ئەگەر خوا مەیلی بێ ٢. بە هومێدی خوا؛ بە یاری خودا ‹انشاءالله سال آینده خانه می‌خریم: ئیشەڵلا ساڵی داهاتوو خانوو دەکڕین›.

**انشعاب** / enše'āb'/، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. حاچە؛ فلیقانە؛ لق؛ پەل: ١. پەل لێ بوونەوە؛ دیاردە یان ڕەوتی جیایی و شاخە شاخە بوون ٢. *[سیاست]* دیاردە یان ڕەوتی جیاوە بوونی دەستەیەک لە ڕێخراوەیەک، بۆ پێکهێنانی(یا چوونە لای) ڕێخراوەیێکی‌تر.

⊡ **انشعاب دادن**: پەل لێ‌بوونەوە/ لێ کردنەوە؛ گەیاندنی بەشێک لە خزمەتگەلی شاری بۆ گەرەکێک.

**انشعاب کردن**: ١. جیا بوونەوە ٢. دابەش

بوون؛ لق لێوه بوون؛ لق لێبوونەوە؛ پەل دانەوە.

**انشعابی** / enše'ābî'، ـها؛ ـان؛ ـون/: [عربی] *صفت.* جیاوەبوو؛ جیاوەبووگ ‹گروه انشعابی: تاقمی جیاوەبوو›.

**انصار** / ansār'/: [عربی] /*اسم.* [ادبی]/ یاوەران؛ یاریدەران؛ یاوەرێ؛ یاردەدەرێ.

**انصاف** / ensāf'/: [عربی] /*اسم.* ۱. ئینساف؛ کاری ڕەوا کردن و لە ناڕەوا دوورگرتن ۲. ڕاستی و دروستی.

◘ **انصاف خواستن:** دادخوازین؛ داوای ئینسافکردن.

**انصاف دادن:** حەقەو دان؛ بە ڕێکوپێکی داوەریکردن.

**انصاف داشتن:** بە ئینساف بوون؛ خاوەن مروەت بوون.

**انصافاً** / ensāfan'/: [عربی] *قید.* بە ڕاستی ‹انصافاً گران است: بەراستی گرانە›.

**انصراف** / enserāf'/: [عربی] /*اسم.* ۱. پاشگەزی؛ تەکینەوە؛ دەستهەڵگری ‹انصراف از تحصیل: پاشگەزی لە خوێندن› ۲. چاوپۆشی ‹انصراف از قبول هدیە: چاوپۆشی لە وەرگرتنی دیاری›.

**انصرافنامه** / enserāfnāme'، ـها/: [عربی/ فارسی] /*اسم.* پاشگەزنامە؛ نامەیێک کە تێیدا نووسەر تەکینەوەی خۆ لە کارێک ڕادەگەیێنێت.

**انصرافی** / enserāfî'، ـها/: [عربی] *صفت.* پاشگەزینە؛ پێوەندیدار یان سەر بە پاشگەزی ‹دانشجوی انصرافی: خوێندکاری پاشگەزینە›.

**انضباط** / enzebāt'/: [عربی] /*اسم.* تەکووزی؛ ڕێکوپێکی؛ مرێسی.

◘ **انضباط داشتن:** ڕێکوپێک بوون.

**انضمام** / enzemām'/: [عربی] /*اسم.* پەیوەست؛ کەوتنە پاڵی شتێک بە شت یان شتگەلێکی ترەوە.

**انضمامی** / enzemāmî'/: [عربی] *صفت.* پەیوەستە.

**انطاکی** / antākî'/: [عربی] *صفت.* ئەنتاکی؛ پێوەندیدار یان سەر بە وڵاتی ئەنتاکیە.

**انطباع** / entebā''، ـات/: [عربی] /*اسم.* [قدیمی]/ چاپ.

**انطباعات** / entebā'āt'/: [عربی] /*اسم.* [قدیمی]/ چاپەمەنی: ۱. کەلوپەلی چاپ ۲. چاپ؛ کار یان ڕەوتی چاپ کردن و بلاوکردنەوە.

**انطباق** / entebāq'/: [عربی] /*اسم.* دە قاودە قی؛ هەمبەری: ۱. [ادبی] وەک یەک بوون؛ وێکهاتنەوە؛ ئاوتایی ‹**انطباق** با محیط: دەقاودەقی لەگەڵ دەوروبەردا› ۲. ڕێک بوون ‹انطباق قانون: دەقاودەقی قانوون›.

**انظار** / anzār'/: [عربی] /*اسم.* ۱. جمعِ ☜ **نَظَر**

**انعام** / an'ām'، ـها/: [عربی] /*اسم.* ۱. [ادبی] خەڵات؛ ڕیزانە ۲. شاگردانە؛ هبوودی؛ بەخشش؛ ئاوەڵانە؛ چێشتانە؛ ئەنعام؛ دەستخۆشانە؛ دەسخوەشانە. هەروەها: **انعام دادن؛ انعام گرفتن**

**انعطاف** / en'etāf'/: [عربی] /*اسم.* نەرمی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی چەمانەوە، ڕاست بوونەوە و گەڕان بە هەر لایێکدا ۲. [مجازی] بەرهەڤی بۆ سازگار بوون لەگەڵ کەسان یان لە بەرامبەری ڕووداوی حەستەمدا. هەروەها: **انعطاف داشتن**

**انعطافپذیری** / en'etāfpazîrî'/: [عربی/ فارسی] /*اسم.* ۱. نحیز؛ شلک و شیاوی؛ توانی باخواردن و پێچدان ۲. توانایی هەڵکردن لەگەڵ دەوروبەردا. هەروەها: **انعطافپذیر**

**انعقاد** / en'eqād'/: [عربی] /*اسم.* ۱. گرساوی؛ ڕەوتی گرسان ‹انعقاد خون: گرسانی خوێن›

٢. کار یان ڕەوتی بەستن؛ گرێدان؛ دامەزراندنی پەیمان یان بڕیارنامەیەک ‹انعقاد قرارداد با شرکتهای خارجی: بەستنی بڕیارنامە لەگەڵ شەریکەگەلی بیانیدا› ٣. دانان؛ بەڕێوەبردن ‹انعقاد مجلس ترحیم: دانانی پرسە›.

**انعکاس** / en'ekās'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. وەدان؛ دانەوە؛ کەوانەکردنەوە؛ دەنگدانەوە.

▣ **انعکاس صوت**: زایەڵە؛ پێژن؛ گومنی؛ دەنگدانەوە.

**انعکاس نور**: بریقەدانەوە؛ شۆقدانەوە؛ تیشک گەڕانەوە؛ تیشک دانەوە؛ تیشک/ وێشک دانەوە؛ شەبقە دانەوە؛ کەوانە کردنیەوەی تیشک.

**انغوط** / anqût'/: [؟] ☜ **آنقوت**

**انفارکتوس** / anfārktûs'/: [فرانسوی]/اسم. [پزشکی] سەکتە؛ جەڵتە؛ جەڵدە؛ دڵەکپێ؛ لە کار کەوتنی دڵ بۆ تاوێک.

**انفاس** / anfās'/: [عربی] جمعِ ☜ **نَفَس**

**انفاق** / enfāq'، ـها/: [عربی]/اسم. خێر؛ بەخشش.

▣ **انفاق کردن**: بەخشین؛ پێدان؛ خێر کردن.

**انفال** / anfāl'/: [عربی]/اسم. ئەنفال: ١. [اسلام] دەسکەوتگەلی شەڕ؛ زەوی بایەر؛ جەنگەڵ؛ کان و میراتی بێمیراتبەر کە بۆ فرۆش نابێ و دەبێتە ماڵی هەموو موسوڵمانان ٢. زنجیرە ڕەشکوژیەکانی ڕژێمی بەعسی عیراق لە کوردان، بە ئامانجی لە ناو بردنیان.

**انفجار** / enfecār'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. کار و ڕەهاتی تەقینەوە؛ تۆقانەوە؛ ترەقینەوە؛ پەقین؛ تەقایوە: ١. ترەکینەوە ‹انفجار بمب: تەقینەوەی بووم› ٢. [کنایی] کوتوپڕ زۆر بوون ‹انفجار جمعیت: تەقینەوەی حەشیمەت›.

▣ **انفجار بزرگ** ☜ **مهبانگ**

**انفجار جمعیت**: تەقینەوەی حەشیمەت؛ لەپڕ زۆر بوونی خەڵک.

**انفجاری** / enfecārî'/: [عربی] صفت. تەقینەوەیی ‹تلەی انفجاری: تەڵەی تەقینەوەیی›.

**انفراد** / enferād'/: [عربی]/اسم. [نامتداول] تەنیایی؛ بە تەنێیەتی.

**انفرادی** / enferādî'/: [عربی] صفت. تەنیایی؛ تەنها؛ بەتەنێ؛ تاکەکەسی؛ بێ کەسێکی تر ‹اتاق انفرادی: ژووری بە تەنیایی›.

**انفس** / anfos'/: [عربی] جمعِ ☜ **نَفس**

**انفصال** / enfesāl'/: [عربی]/اسم. لێکبڕاوی: ١. وەلانراوی؛ دەرکراوی؛ کار یان ڕەوتی لابردن لە کارێک ‹به انفصال دایم از خدمات دولتی محکوم شد: بە لێکبڕانی هەمیشەیی لە ڕاژەگەلی دەولەتی مەحکووم کرا› ٢. [نامتداول] جیایی؛ دابڕاوی؛ جیابوونەوە؛ لێکبوونەوە؛ جیا کردنەوە؛ هەڵکەندن.

**انفعال** / enfe'āl'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. بێجموجووڵی؛ دژداماوی؛ ڕەوتی تێوەگلان؛ پێوە بوون؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی چالاکی کارتێکەر ‹ارتش دشمن در حالت انفعال به سر می‌برد: ئەرتەشی دوژمن لە بێجموجووڵیدایە› ٢. خەجاڵەتباری؛ شەرمەساری؛ تەریقەو بوون؛ بە خۆدا شکانەوە؛ سەرشۆڕی.

**انفعالی** / enfe'ālî'/: [عربی] ☜ **مُنفعل**

**انقراض** / enfekāk'/: [عربی]/اسم. جیایی؛ کار یان ڕەوتی لێکجیاوە بوون.

**انفلاسیون** / anfelās(i)yon'/: [فرانسوی] اسم. [اقتصاد] ئاوسانی پارە؛ کیسی پوولی؛ ڕەوتی بەرە بەرە کەمبایەخ بوونەوەی پارەی ولاتێک لە چاو پارەی ولاتانی تر و

کزبوونەوەی بۆ شت‌کرین.

**انفکـاک** / 'enfekāk/: [عربـی]/اسـم. جیـایی؛ کار یان ڕەوتی لێک جیاوە بوون.

**انفیـه** / 'anfîye/: [عربـی]/اسـم. نـشووک؛ سوعووتی؛ سعووتی؛ بڕنوتی؛ کۆمەڵەیێک لە هـاردڕاوەی دەرمانگـەلی بۆنخـۆش و پژمەهێنەر کە بە مەبەستی سەرخۆش بوون هەڵیدەمژن.

**انقبـاض** / 'enqebāz، ـها؛ ـات/: [عربـی]/اسـم. ڕەوتی هاتنـەوەیـەک؛ هاتنـەیـەک؛ فلـین؛ چوونـەیـەک؛ گرژینـا: ١. دۆخ یـان چۆنیـەتی کۆوە بوون و چوونـە نـاو یـەک ‹انقباض پوستەی زمـین: هاتنـەوەیـەکـی پێـستەی زەوی› ٢. *[فیزیک]* کـەمبوونـەوەی بارسـتایی شـتێک بـێ پەیدابوونی ئاڵوگۆڕ لـە تایبـەتمـەندیەکانیـدا ٣. *[فیزیولـوژی]* دۆخ یـان ڕەوتی خـڕ بوونـەوەی ماسوولەگەلی لەشی گیانلەبەرێک.

**انقباضـی** / 'enqebāzî/: [عربـی] صـفت. هاتنەیـەکـی؛ هاتنـەوەیـەکـی ‹حرکـت انقباضـی: جووڵانی هاتنەیەکی›.

**انقـراض** / 'enqerāz/: [عربـی]/اسـم. تـەفـر و توونـا؛ قـەڵاچۆ؛ قـڕ؛ کـار یـان ڕەوتی تیـاچوون یـان هـەڵـپێچانەوە ‹حملـەی اسـکندر موجـب انقـراض سلـسلەی هخامنـشی شـد: هێرشـی ئـەسـکەنـدەر بـوو بـە هـۆی تـەفـر و توونـای زنجیرەی هەخامەنیشی›.

**انقـضا** / 'enqezā/: [عربـی]/اسـم. تێپـەڕی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی تێپـەڕیـن و بـە سـەر چوون (کـات یـان کەڵـک) بـۆ شـتێ یـان مەبەسـتێک ‹انقـضای مهلـت معـین: تێپـەڕ بـوونی مـاوەی دیاریکراو›.

◘ **انقضا یـافتن:** تێپـەڕ بـوون؛ بـەسـەرچـوونی کـات/ کەڵـکی پێویـست؛ دوایـی هـاتنی کات/ کەڵک بۆ شتێ یان مەبەستێک.

**انقطـاع** / 'enqetā'/: [عربـی]/اسـم. *[ادبـی]* بـڕاوی؛ پچـڕاوی؛ پـساوی؛ دابـڕاوی؛ لێکبـڕاوی؛ بـڕیاگی؛ وەسـان ‹نقطـەی انقطـاع: خالـی لیکبرانەوە›.

**انقلاب** / 'enqelāb، ـها؛ ـات/: [عربـی]/اسـم. ١. *[سیاسـت]* بزووتنـەوە؛ ڕاپـەڕیـن؛ شـۆڕش؛ هەڵتەزینەوە؛ گـەلـەکۆمـەی ئـاپۆڕەی خـەڵـک دژ بـە دەسـەڵاتـداران ‹انقـلاب مـردم ایـران در سال ١٣٥٧ رخ داد: بزووتنـەوەی خـەڵکی ئێـران لـە سالـی ١٣٥٧دا بـوو› ٢. ئـاڵوگـۆڕی؛ هـەڵـتەزینـەوە ‹انقـلاب جـوی: ئـاڵوگـۆری کەشی› ٣. *[نجـوم]* هـەڵـگەڕانـەوە؛ گـەیـشتنی خـۆر بـە دوورتـرین/ نزیکتـرین شـوێنی خـۆی لـە دانیـشتوانی زەمینـەوە ‹انقـلاب تابـستانی: هەڵگەڕانەوەی هاوینی›.

◘ **انقـلاب آزادیـبخش** ☜ **انقـلاب رهایی‌بخش**

**انقـلاب اسـتقلال طلبانـه** ☜ **انقـلاب رهایی‌بخش**

**انقـلاب بـورژوازی:** شۆرشـی بازاڕیگـەل؛ شۆڕشـی بـە ڕێبـەرایـەتی پیـشەکـاران و بازرگانـان بـۆ هـەڵـگەڕاندنـەوەی دەسـەڵات، زل زەوینداران و شا و مەلایان.

**انقلاب تابـستانی:** هـەڵـگەڕانـەوەی هـاوینی؛ گە یشتنی خۆر بـە دوورتـرین شـوێنی خـۆی لـە دانیـشتوانی زەوینـەوە، لـە سـەرەتـای هاویندا.

**انقـلاب رهـایی‌بخـش:** شۆڕشـی ڕزگاری خـوازی؛ شۆڕشـی دژ بـە بیانیـان، بـۆ گـەیـشتن بـە سـەربـەخـۆیی نـەتـەوەیـی: **انقلاب آزادیبخش؛ انقلاب استقلال‌طلبانه**

**انقـلاب زمـستانی:** هـەڵـگەڕانـەوەی زسـتانی؛ جێگـر بـوونی خـۆر لـە دوورتـرین شـوێنی خۆی لـە دانیـشتوانی زەوینـەوە، لـە کۆتـایی مانگی سەرماوەز و سەرەتای زستاندا.

**انقـلاب سـبز:** شۆرشـی سـەوز؛ گۆڕانکـاری

زانستی و بنەڕەتی لە شێوازی کشت و کاڵیدا.

**انقلاب سرخ:** شۆڕشی سوور؛ شۆڕشی کاریگەری و سەپانی کە هاوڕێ لەگەڵ خوێنڕژان و کەللەپژانە.

**انقلاب سفید:** شۆڕشی سپی؛ ناوێک بوو حەمەڕەزاشای پەهلەوی دابوویە بەرنامەگەلی کۆمەلایەتی خۆی.

**انقلاب سوسیالیستی:** شۆڕشی کۆمەڵەخوازی؛ شۆڕشی زەحمەتکێشان بۆ هەموانی و نەتەوەیی‌کردنی سەرمایە و ئامێرگەلی داهێنەر.

**انقلاب صنعتی:** شۆڕشی پیشەسازی؛ ئاڵوگۆڕێکی گەورە کە بە دوای بەکار هێنانی هێزی هەڵم لە بریتانیای سەدەی نۆزدەوە و دوایی لە ولاتانی تری ئورووپای ڕۆژاوا و ئەمریکا و ژاپوندا سەری هەڵدا.

**انقلاب فرهنگی:** شۆڕشی فەرهەنگی؛ تێکۆشانی بە پەلە و تونوتیژی بڕێ لە حکوومەتە تازەکان بۆ ئاڵوگۆڕ پێدانی یەکجارەکی فەرهەنگی نەتەوەیەک و دووربوونەوە لە هەرچی لە حکوومەتی پێشوودا باو بووە.

**انقلابی** / enqelābî'/: [عربی] *صفت*. ١./ـها؛ ـان؛ ـون/ شۆڕشگێڕ؛ شۆڕشڤان؛ خەباتگێڕ؛ لایەنگری شۆڕش؛ کەسێ کە لە ڕاپەڕینی گەل دژی دەسەلاتدار، بەشدارە ٢. شۆڕشگێرانە؛ شۆڕشی؛ سەر بە شۆڕش ‹سخنان انقلابی: قسەی شورشگیرانە›.

**انقلابین** / enqelābeyn'/: [عربی]/*اسم*. *[نجوم]* دوو شوێن لە کە شدا کە خۆر، ساڵێ جارێک دەکەوێتە هەرکام لەو شوێنانە؛ یەکێکیان لە سەرەتای هاوین (هەڵگەڕانەوەی هاوینی) و ئەویکەیان لە سەرەتای زستاندا (هەڵگەڕانەوەی زستانی).

**انقیاد** / enqiyād'/: [عربی]/*اسم*. *[ادبی]* نۆکەری؛ فەرمانبەری؛ سەرسپێراوی.

**انکار** / enkār'/: [عربی]/*اسم*. حاشا؛ هاشا؛ ئینکاری؛ ماندەل؛ نەدرکاندنی ڕاستی.

▣ **انکار کردن:** حاشا کردن؛ ئینکارکردن؛ خوەنین؛ نەچوونە ژێر؛ دانەژێر؛ وەرنەگرتن ‹دزدیدن ساعت را انکار کرد: دزینی سەعاتەکەی حاشا کرد›.

**انکرالاصوات** / ankarolasvāt'/: [عربی] *اسم*. بۆڕە؛ سەرە؛ زڕ و زلترینی دەنگان.

**انکسار** / enkesār'/: [عربی]/*اسم*. *[ادبی]* ١. /ـها/ شکاوی؛ شکەس؛ شکاویەتی؛ داشکاوی؛ مرپایی ٢. خاکەساری؛ خۆشکێنی.

**انکشاف** / enkešāf'/: [عربی]/*اسم*. *[نامتداول]* کار یان ڕەوتی دۆزرانەوە؛ یۆزیایوە.

**انکوباتور** / ankûbātor'، ـها/: [فرانسوی] *اسم*. ١. ماشێنی جووجەڵەکێشی ٢. دەزگای چاندنی باکتری لە ئازمایشتگادا ٣. *[پزشکی]* دەزگای ڕاگرتنی منالی تازەبوو و کاڵ لە نەخۆشخانەدا.

**انکیزیسیون** / ankîzîs(i)yon'/: [فرانسوی] *اسم*. بڕواپشکنی؛ زنجیرە کارگەلی کلیسا لە سەدە ناوەندیەکان لە ئورووپادا، بۆ سەرکوت‌کردنی نەیاران.

**انگ** / ang'، ـها/: *اسم*. ١. نیشانە؛ درۆشم؛ نیشانەیێک کە دەیکوتنە سەر کالادا ٢. *[نامتداول]* شیرە؛ ڕینگ؛ ڕنگ؛ ئاو و تراوی میوەی گووشراو ٣. *[نامتداول]* گونج؛ تەنبوورە؛ زەنبوورە؛ گۆنج؛ حوشترگەڵوو.

▣ **انگ انداختن:** ١. تۆم تکاندن؛ بەر هاویشتن/ خستن؛ تامازرۆیی کردن ٢. زۆر بە نیاز بوون.

**انگ زدن:** ١. نیشانە لێدان؛ درۆشم کوتان؛ مۆر لێدانی کالا ٢. *[کنایی]* بوختان

کردن؛ ناتۆره لێنان؛ ناو نیتکه لێنیان.

**انگار** [1] / engār' ،ـها/: *اسم. [نامتداول]* گومان؛ گریمان؛ گاوا؛ تێڕوانین؛ بۆچوون؛ مەرسە؛ وازانین.

**انگار** [2]: *قید.* ١. وێدەچێ؛ وادیارە؛ وادیار ئەدا؛ خویایە؛ گوایە؛ گاوا؛ هەر دەڵێی؛ هەروەکی؛ هەچکوو؛ مەنی؛ مەری؛ ماچی؛ ئجیۆ؛ ئەجۆ ‹هیچ تکان نمی‌خورد، انگار مرده است: هیچ ناجمێ، هەر دەڵێی مردووە› ٢. وابزانە؛ وابزا؛ گریمان؛ وابزانم؛ پاسە بزانە ‹انگار من مرده‌ام، تو چطور می‌خواهی زندگی کنی؟: وابزانە من مردووم، تۆ چۆن دەتەوێ بژیت؟›.

▣ **انگار نه انگار:** وەک ئەڵێی... نە...؛ مەرەجیۆ ‹انگار نه انگار پدر و پسریم: وەک ئەڵێی باب و کوڕ نەبین›.

ـ **انگار** [3]: *پیواژه.* ـگر ‹سهل‌انگار: سووک‌گر›.

**انگاره** / engāre' ،ـها/: *اسم.* ١. گریمان ٢. *[نقاشی]* گەلالە؛ شێواز؛ ڕێژەی سەرەتایی ٣. *[ریاضی]* بیچم؛ تەشک؛ وێنە ٤. کلافە؛ قلف؛ ئالقەیەکی دەستەدار بۆ دەوری ئیسکان و لیوان.

**انگاریدن** / engārîdan' ☜ **انگاشتن**

**انگاشت** / engāšt' /: *اسم.* وەهم؛ گومان؛ گریمان.

**انگاشتن** / engāštan' /: *مصدر. متعدی.* //**انگاشتی:** واتزانی؛ **می‌انگاری:** وادەزانی؛ **بینگار:** وابزانە// ١. وازانین؛ گومان بردن؛ سەبارەت بە شتێ یان کەسێک داوەری کردن، بە بێ ئەوەی دروستی یان نادروستیەکەی ڕوون بێتەوە ٢. ئەجیەی؛ شتێ یان کەسێک بە جێی دیتری ڕەچاو کردن ‹او را مادر خود انگاشتن: ئەو بە دایکی خۆ زانین› ✻ **انگاریدن.** هەروەها: **انگاشتنی**

■ صفت مفعولی: **انگاشته** (وازانراو)/ مصدر منفی: **نَینگاشتن** (وانەزانین)

**انگبار** / angabār' ☜ **آنجبار**

**انگبین** / angabîn' ،ـها/: *اسم. [ادبی]* ١. هەمگین؛ هەنگوین؛ هەنگوێن؛ هنگڤین؛ هەنکڤ؛ هەنگەمین ٢. شیرە؛ ڕینگ؛ ڕنگ ✻ **انجبین**

**انگدان** / angadān' ☜ **آنجدان**

**انگشت** / angošt' /: *اسم.* قامک؛ ئەنگوست؛ ئەنگووس؛ ئەموست؛ هونگوست؛ هنگست؛ هنگوست: ١. /ها؛ ـان/ تبل؛ تل؛ تلی؛ تلهی؛ تپل؛ پل؛ پلی؛ پیلک؛ کلک؛ کلکە؛ کیلک؛ دپل؛ گست؛ گێشت؛ کشک؛ هەر کام لە ئەندامگەلی دواینەی دەست و پێی مرۆڤ و زۆرێک لە گوهانداران و پەلەوەران، کە لە مرۆڤ و بڕێک گیانەوەریتردا بە نینۆک دوایی پێ دێ ‹انگشت دست: ئەنگوستی دەست› ٢. یەکەی درێژایی بەرانبەر بە ٥ سانتیمتر ‹به طول چهار انگشت: بە درێژی چوار قامک›.

▣ **انگشت ابهام** ☜ **انگشت شست**

**انگشت اشاره:** قامکەشادە؛ دۆشاومژە؛ دووهەمین قامک کە کەوتۆتە پەنای ئەنگوستە گەورەوە: **انگشت سبّابه؛ انگشت شهادت**

**انگشت بنصر** ☜ **انگشت حلقه**

**انگشت حلقه:** براتووتە؛ تیکلەلێسە؛ توتوانک؛ والە گولێ؛ قامکی نێوان تووتە و بالابەرزە.

**انگشت سبابه** ☜ **انگشت اشاره**

**انگشت شست:** کەلەموست؛ قامکە زلە؛ گشت پلل؛ گشتا پلل؛ تبلا مەزن؛ تلیا مەزن؛ قامکە گەورە؛ ئەنگووسە گەورە؛ کلکەکەلە؛ کلکەگەورە؛ پنجە گەورە؛ کەلە ئەموست؛ کەلە ئەنگوست؛ بەرانێ؛ هەپشە کوشێ؛ یەکەمین و چاخترین قامکی دەست و پا: **انگشت ابهام**

**انگشت شهادت** ☜ **انگشت اشاره**

**انگشت کوچک:** تووته؛ پووته؛ پیت؛ قلیچ؛ قلیچان؛ قلینج؛ قینجک؛ قلینجک؛ تبلیا بیچک؛ گشت قلانج؛ گشتا میت؛ کولێ؛ گولێ؛ قامکه تووته؛ قامکه چکۆله؛ بچووکترین و ئاخرین قامک.

**انگشت وسط:** زەڕنەقووتە؛ بەرزەملێ؛ تلیا ناوین؛ گیشتا مێونەن؛ بالابەرزە؛ تلیاناوی؛ قامکی قووتێ؛ قامکە قوچە؛ ئال؛ تبلی ناوی؛ سێهەم قامک لە پەنجەدا.

▣ **انگشت به دهان/ لب ماندن:** *[کنایی]* واقوڕمان؛ سەرسووڕمان.

**انگشت به لب گذاشتن / نهادن:** *[مجازی]* خوازیاری بێدەنگی بوون؛ داوای بێدەنگی کردن.

**انگشت رساندن:** *[کنایی]* دەس پێ گەیاندن؛ دەسدرێژی کردن؛ دەس یاونەی.

**انگشت زدن:** ۱. دانانی قامکی شادە لە سەر بەڵگە ۲. قامک لێدان؛ کلک چەقنانیە ‹انگشت بزن ببین داغ نباشد: قامکی لیدە بزانە داخ نەبێ›.

**انگشت کسی در کار بودن:** *[کنایی]* لەژێرەوە دەستی کەسێکی تێدا بوون؛ دەس تێوەردانی پەنامەکی کەسێک.

**انگشت کوچک کسی هم نشدن:** قامکە چکۆلەیشی نەبوون؛ زۆر کەمتر بوون لە کەسێک ‹آرام انگشت کوچک پدرش هم نمی‌شد: ئارام قامکە چکولەی باوکیشی نەدەبوو›.

**انگشت گذاشتن:** ۱. قامک نانە بان شتێکەوە؛ شتێک نیشاندان؛ کلک ئاستەیرە ۲. دەس نیانە سەر شتێک؛ سوور بوون لە سەر باسێک. هەروەها: **انگشت نهادن**

**انگشت گزیدن:** *[کنایی]* ئەنگووس بردنە دەما؛ پەژیوان بوونەوە؛ ئاخ هەڵکێشان.

**انگشت نهادن** ☜ **انگشت‌گذاشتن ـ۲**

**انگشتانه** / angoštāne/ ـــهـــا/: *اسم.* ۱. ئەنگووسەوانە؛ پەنجەوانە؛ گوزڤان؛ قووچەکە؛ سەرتلی؛ سەرتلیک؛ گوستیل؛ قووچەکە دورمان؛ ئەموستانە؛ هەنگوستیر؛ هەنگوستەک؛ تبلک؛ کۆڤک؛ قوومچک؛ تلەک؛ دەزگا؛ دەسگا؛ هنگوستۆک؛ هنگستۆ؛ نازەنگوشت؛ کێلکەوانە ۲. گوڵەمەنگوولە؛ کاسەگوڵ؛ دەرمانەدڵە؛ وڕەگیا؛ بنەگیایەکی دوو تا سێ ساڵەیە کە ساقەتەی خڕ و گەڵای پان و گەورە و بنی ئەستوور و ڕاستی هەیە ۳. کلکەوانە؛ ئەنگووسەوانە؛ گوڵی گیای گوڵەمەنگوولە کە ڕاست وەک ئەنگووستەوانەی دروومانە و بۆ دەرمان ئەشێ.

**انگشت‌بر** / angoštbor/ ☜ **آبدُزدک ـ۲**

**انگشت پیچ** / angoštpîč/ ـــهـــا/: *اسم.* ئەنگوست پێچ؛ جۆرێک شیرینیە.

**انگشتر** / angoštar/ ـــهـــا/: *اسم.* گشتانە؛ گشتر؛ کلکەوانە؛ کلوانک؛ کۆلکانە؛ ئەنگولیسک؛ هەنگولیسک؛ هونگوستیل؛ هونگوستیلک؛ ئەنگوستیلە؛ هەنگوسانە؛ ئەنگوستەویلە؛ ئەنگوستانە؛ ئەنگوشتەر؛ ئەموستەوێڵە؛ ئەوستیلە؛ هونگولیر؛ هنگلیسک؛ هنگولسیک؛ گوستیل؛ گوستیلک؛ گوستیرک؛ ئاڵقەی خشڵی قامک: **انگشتری**

**انگشتری** / angoštarî/ ـهـا/: *اسم. [ادبی]* ☜ **انگشتر**

**انگشت‌شمار** / angoštšomār/: *صفت.* ئەنگوستژمێر؛ بە ژمارەی قامکی دەستێک؛ چەند دانە؛ چوار ـ پێنج دانە .

**انگشتک** / angoštak/: *اسم.* ۱. پل؛ پلە؛

پلیٚ؛ پل‌تەقێنە؛ تلی ۲. قامکینە؛ تلین؛ وەک قامک.

▣ **انگشتك زدن:** پل لێدان؛ پل‌تەقاندن؛ پلە لێدان.

**انگشت‌نگاری** / angoštnegārî' ، ـها/: اسم. قامکمۆر؛ پەنجەمۆر؛ کار یان ڕەوتی هەڵگرتن و تۆمارکردنی ئاسەواری هێڵی سەرقامکان (بەتایبەت قامکە شادە) بۆ ناسینەوەی خاوەنەکەی.

**انگشت‌نما** / angoštnemā'/: صفت. [گفتاری] بەرچاو؛ دیار؛ کلکەنما؛ گای قەشان؛ گای مارۆ؛ ناسراو (بە تایبەت بۆ خراپە) ‹در شیطنت انگشت‌نما بود: لە هاروهاجیدا بەرچاو بوو›.

**انگشتی**[1] / angoštî' ، ـها/: اسم. ۱. پەنجەوانە؛ جێگای قامکان لە دەستەوانەدا ۲. ملهێب؛ شەنە؛ شەن؛ شەنیٚ ۳. ئەنگوستانە؛ شوێنێک لە پەڕەی کتێب و دەفتەر (بەتایبەت فەرهەنگ) کە شوێنی قامکی لیٚ هەڵدەکەنرێ و پیتی ئەلفوبێتکەی لیٚ دەنووسرێ تا بەو نیشانەوە بەشی خوازراو زووتر بدۆزرێتەوە: **اندیسک؛ ایندکس**

**انگشتی**[2]: صفت. قامکینە؛ خاوەنی قامک ‹شش انگشتی: شەش قامکینە›.

**انگل** / angal' ، ـها/: اسم. لاکوت: ۱. بوونەوەرێک کە لە پەنای بوونەوەرێکی دیکەدا دەژی و بژیوی لەوە ‹انگل روده: لاکوتی ڕیخۆڵە› ۲. [مجازی] پاشاو خۆر؛ بەرماو خۆر؛ سەربار؛ لامێژ؛ لامژ؛ خۆرە؛ مشەخۆر؛ چەورە؛ لاورگە ‹آدم انگلی: مرۆی لاکوت›.

**انگل‌شناسی** / angalšenāsî'/: اسم. لقێکی ژینگەناسیە کە لاکوتگەلی گیایی و جانەوەری دەناسێتەوە و لێدەکۆڵێتەوە. هەروەها: **انگل‌شناس**

**انگلک** / angolak'/: اسم. ۱. پووتە؛ کلکەتووتە؛ قلینجک؛ قامکی چکۆلە ۲. سووک؛ بز؛ کلکەقنگی؛ جووک؛ جۆنگ؛ جووز؛ جوز؛ چووز؛ کلکەبزێ؛ چوکلەبزێ؛ کاری پەنجە بۆ قنگ بردن: **انگولک**

▣ **انگلک کردن:** [کنایی] چوکلە چزیٚدان: ۱. دەسکاری کردن ۲. چۆلە چزیٚدان؛ کلکەبزێدان؛ ئازاردان ‹این قدر این بچه را انگلک نکن: هێندە چولەچزیی ئەم مندالە مەدە›.

**انگلی** / angalî'/: صفت. ۱. لاورگانە؛ مشەخۆرانە؛ پاشاوخۆری؛ چەورەیی؛ لامژی ‹زندگی انگلی: ژیانی لاورگانە› ۲. لاکوتی؛ سەرچاوەگر لە لاکوت ‹بیماریهای انگلی: نەخۆشینی لاکوتی›.

**انگلیسی**[1] / engelîsî'/: اسم. ئینگلیزی؛ ئینگلیسی: ۱. /ـها؛ ـان/ خەڵکی ئینگلیز ۲. لە زمانگەلی هیندو ئوروپایی؛ زمانی دانیشتوانی دورگەی ئینگلیز، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئوستralیا و زوربەی کانادا و بریٚ لە وڵاتانی‌تر.

**انگلیسی**[2]: صفت. ئینگلیزی؛ ئینگلیسی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئینگلیز.

**انگم** / angom'/: اسم. جەوی؛ جیوە؛ جەوگ؛ ژوی؛ شیرەی هەنگوژە؛ شیرەی گیای هەڵز؛ جیوەی ڕەشە گوێنی ڕەقهەڵاتووی دار.

**انگور** / angûr' ، ـها/: اسم. تریٚ؛ تری؛ ترە؛ هەنگوور؛ هەنگووری؛ هەنگۆر؛ هەنگوورە؛ هنگور؛ هنگەریر؛ هەنگیر؛ هەنوویر؛ هەوور؛ ئەنگوور؛ ئەنیوور؛ ئەنگیر؛ ئەنگیر؛ میوەی دارە مێو.

▣ **انگور فرنگی:** تەرزەمارانە؛ تریٚمارانە: **دیوانگور؛ تالش انگور**

**انگورپزان** / angûrpazān'/: اسم. ڕەزبەر؛

بۆڵەوەرە؛ وەرزی پێگەیشتنی ترێ.

**انگولک** / angûlak'/ ☜ **اَنگُلَک**

**انگیختن** / angîxtan'/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**انگیختی**: دنەتدا؛ **می‌انگیزی**: دنەدەدەی؛ **بینگیز**: دنە بدە// ۱. دنەدان؛ بزواندن؛ هەڵخراندن؛ دامۆچاندن؛ هێزاندن؛ هۆرخێزنەی؛ بوونە هۆی کارێک یان مەبەست و هەنگیزەیێک ۲. ئاخێزاندن؛ بەدیهێنان؛ بەرهەمهێنان؛ وەش کەردەی ‹ترحمی در دل آرام انگیخت: بەزەیێکی لە دڵی ئارامدا ئاخێزاند› ۳. هەڵپێچاندن؛ دنەدان؛ هاندان؛ هەڵخراندن ٤. *[قدیمی]* هەنگاوتن؛ ئەنگاوتن؛ هەنگووتن؛ ناردن؛ بەڕێ کردن؛ ڕەوانەکردن؛ کیاسەی ٥. *[قدیمی]* بزواندن؛ جووڵاندن؛ لڤاندن؛ نرڤاندن؛ لەبتاندن؛ ئەرەجمنەی؛ جووڵنەیەوە؛ لە جێگەی خۆ جماندن: **برانگیختن؛ انگیزاندن**. هەروەها: **انگیختنی**

■ صفت فاعلی: **انگیزنده** (دنەدەر) / صفت مفعولی: **انگیخته** (دنەدراو) / مصدر منفی: **نینگیختن** (دنە نەدان)

**انگیخته** / angîxte'/: *صفت. [ادبی]* هێزراو؛ ئاخێزراو؛ هەڵخرێنراو؛ ورووژاو.

**ـ انگیز** / angîz'/: پیواژە. ــ بزوێن؛ ــ هێژێن؛ وەدیهێنەر ‹دلانگیز؛ غم‌انگیز: هەستبزوێن؛ خەمبزوێن›.

**انگیزاندن** / angîzandān'/: *مصدر. متعدی. [نامتداول]* بزواندن؛ هەڵخراندن؛ ورووژاندن: **انگیختن**. هەروەها: **انگیزاندنی**

■ صفت فاعلی: **انگیزاننده** (بزوێنەر)/ صفت مفعولی: **انگیزنده** (بزوێنراو)/ مصدر منفی: **نَینگیزاندن** (نەبزواندن)

**انگیزش** / angîzeš'/: *اسم.* بزوان؛ هەڵخران: ۱. کار یان ڕەوتی بزواندن؛ هێژاندن ۲. زیخان؛ ئەوەی کە زیندوەرێک هان دەدا بۆ درێژەدان بە ژیان و پێویستیەکانی تێکۆشێ.

**انگیزنده** / angîzande'/: *صفت.* هەڵخرێنەر؛ بزوێنەر؛ ورووژێنەر؛ دامۆچێنەر.

**انگیزه** / angîze'، ـها/: *اسم.* بزوێنە؛ ئەنگێزە؛ هەنگێزە: ۱. واز؛ ئەوەی دەبێتە هۆی بزواندن ۲. هۆ و هۆکارێک کە جم و جووڵی ژینەوەران بەدی دێنێت یا زیادی دەکا.

**انوار** / anvār'/: [عربی] جمعِ ☜ **نور**

**انواع** / anvā''/: [عربی] جمعِ ☜ **نَوع**

**انهار** / anhār'/: [عربی] جمعِ ☜ **نَهر**

**انهدام** / enhedām'/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. وێرانی؛ خاپووری؛ کاولی ‹انهدام پلها: وێرانی پردگەل› ۲. تیاچوویی؛ نابوودی؛ لەبن‌هاتوویی ‹انهدام سپاه دشمن: نابوودی سپای دوژمن› ۳. وێرانکاری؛ کاولکەری؛ ڕووخێنەری؛ کار و ڕەوتی داتەپاندن؛ هەڕماندن؛ تێک‌ڕماندن ‹چنگیز بە قتل و غارت و انهدام شهرها پرداخت: چەنگیز کەوتە کوشت و بڕ و وێرانکاری شارگەل›.

**انیاب** / anyāb'/: [عربی] *اسم. [ادبی]* کەڵبە؛ کەڵوە؛ کلب؛ چوار ددانی چزداری بان و خواری دوو سووچی دەم: **نیش**

**انیس** / anîs'/: [عربی] *اسم. [ادبی]* یار؛ هۆگر؛ هاودەنگ؛ ئاودەنگ؛ هاودەم؛ هەڤاڵ؛ هەواڵ؛ ئەوەی خۆ بە دۆستایەتیەوە دەگرێ.

**انیسون** / anîsûn'، ـها/: [معرب از یونانی] *اسم.* ڕازیانەی ڕۆمی؛ ڕازیانە کێویلە؛ ڕازیانە کێفی؛ ئەنیسوون.

**انیفرم** / onîform'، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* جل‌وبەرگی وەک یەکی دەستەیەک: **اُنیفورم؛ اونیفورم؛ یونیفرم**

**انیفورم** / onîform'/: [فرانسوی] ☜ **اُنیفُرم**

**انیماتور** / anîmātor'، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* چێکری فیلمی ئەنیمەیشن: **پویانما**

**انیمیشن** / anîmeyšen' ـها/: [انگلیسی]/اسم. بیبیجان؛ وێنهگهلێک که له گرتنی یهکلهدوای‌یه‌کی وێنه له شتگەلی بێ‌گیان (وەک بووکەشووشە و نووسراوە و...) گیراوە و کارێکی پێ کراوە کە وەک فیلم دەجوولێ: **پویانمایی**

**او** / û' ، آنان، ایشان/: ضمیر. ئەو؛ هەو؛ ڤی؛ وی(بۆنێر)؛ ڤێ؛ وێ(بۆمێ)؛ یا؛ یۆ؛ یە ی؛ یی؛ هاو؛ ئڤی؛ وە؛ ئاد (بۆ نێر)؛ ئادە (بۆ مێ)؛ جێناوی ئاماژە بۆ سێهەم کەسی تاک ‹او دوست خوبی است: ئەو دۆستێکی باشە›.

**اوا** / evā'/: صوت. [گفتاری] ئەی؛ ئەیەڕۆ؛ ئەیڕۆ؛ حەی‌حەی؛ ئاخ؛ بۆ سەر سوورمانە ‹اوا، هنوز اینجایی!: ئەی، هێشتا لێرەی!›.

**اوائل** / avā'el'/: [عربی] ☜ **اوایل**

**اواخر**[1] / avāxer'/: [عربی] جمعِ ☜ **آخِر**

**اواخر**[2]: قید. [گفتاری] ئاخر و ئۆخر؛ دوادوایی؛ نێزیک بە برانەوە ‹در اواخر پاییز مهمانش بودیم: لە ئاخرو ئوخری پاییزدا میوانی بوین›.

**اواریه** / avārîye' ، ـها/: صفت. تلیساو؛ خووساو؛ فیسیاگ؛ پیس و چلکن یا هەلپشاوتوو (لە مەڕ کەل‌پەلەوە): **عَواریه**

**اواسط** / avāset'/: [عربی] حرف. نیوە؛ نێوان؛ چەق؛ دلێ؛ دوڕ؛ دەور و بەری نیوە ‹اواسط راه: نیوەی ڕێ›.

**اوامر** / avāmer'/: [عربی] جمعِ ☜ **اَمر**

**اوان** / avān'/: [عربی]/اسم. [ادبی] سەردەم؛ هێل؛ جەنگە؛ هەڕەت؛ کات؛ وەخت؛ سەرو بەند؛ چاخ؛ دەم؛ تاف؛ هنگ؛ گاڤ ‹در اوان جوانی: لە سەردەمی لاوەتیدا›.

**اوایل**[1] / avāyel'/: [عربی] ۱. جمعِ ☜ **اوّل**[1] ۲. ☜ **اَوّلیات** ✻ **اوائل**

**اوایل**[2]: قید. سەرەتا؛ دەمەدەم؛ دەم؛ ‹اوایل غروب: دەمەدەمی ئێوارە›: **اوائل**

**اوباش** / owbāš, 'o:bāš' ، ـها؛ ـان/: [عربی] /اسم. شەلات؛ لات؛ چەورە؛ جەلۆ؛ هەرزە؛ سەرسەری؛ ئەلوات؛ ڕەجاڵە؛ قەلاش؛ سنۆتە؛ خۆڕی‌وتۆڕی؛ هەرچی ـ پەرچی؛ هەتیو ـ مەتیو؛ ڕووتە و پووتە؛ لات و لووت؛ عەلوو ـ جەلوو؛ لات‌و لەوا؛ گەجەر ـ گۆجەر؛ چەورە و بێکارە؛ لۆتی و پۆتی.

**اوباشگری** / owbāšgarî, 'o:bāš-' ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. خوێڕیگەری؛ شەلاتی؛ لاتی؛ ئاکاری دژی کۆمەلایەتی (وەک قیرەی ناجۆر، شەڕفرۆشی و زۆربێژی و...).

**اوباشی** / owbāšî, 'o:bāšî'/: [عربی]/اسم. خوێڕیگەری؛ لاتی؛ شەلاتی.

**اوبه** / owbe'/: [ترکی]/اسم. بینە؛ زۆم؛ زومە؛ هۆبە؛ هۆب؛ ئوبە؛ جێگەی کۆمە لە چادری پێکەوە.

**اوپتیک** / optîk'/: [فرانسوی] ☜ **اُپتیک**

**اوپتیکی** / optîkî'/: [فرانسوی] ☜ **اُپتیکی**

**اوت** / owt, 'o:t'/: [انگلیسی]/اسم. [ورزش] ئەوت؛ دەشت؛ دۆخ یان چۆنیەتی کەفتنە دەرەوەی تۆپ لە زەوی یاری. هەروەها: **اوت شدن؛ اوت کردن**

**اوت** / ût'/: [فرانسوی]/اسم. ئاب؛ تەباخ؛ مانگی هەشتەمی ڕۆمی کە ۳۱ ڕۆژە و لە ۱۰ی گەلاوێژەوە دەست پێ‌دەکات: **آگوست**

**اوج** / owc, 'o:c'/: [معرب از سنسکریت]/اسم. ترۆپک؛ تەشق؛ دوچک؛ دهار؛ قووچکە؛ کۆپ؛ کەلنایا؛ کولەکول؛ ئەوج؛ بلندایی؛ تەوقە؛ تەوقەتە؛ پۆپە؛ دوند؛ سەرلووتکە؛ چلەپۆ؛ چلەپۆپە؛ بەرزترین شوێن.

▣ **اوج و حضیض**: هەوراز و نشێو؛ بان و خوار؛ کەندولەند؛ بەرز و نزم؛ بەرز و نەوی.

▣ **اوج گرفتن**: ۱. بەرز بوونەوە ‹صدایش اوج گرفت: دەنگی بەرز بووە› ۲. توند بوون؛ قووڵ بوون ‹جنگ اوج گرفت: شەڕ توند

بوو〉.

**اوجـا** / ûcā'، ـهـا/:/اسم. وەج؛ ڕەشـدار؛ جـۆرێ وزم؛ درەختێکی بێشەیـی بـە بـەرزی نزیـک ۳۰ میتر: **وَج**

**اوخ** / ûx/': صوت. ۱. ئـاخ؛ وشـەیـەکـە بـۆ درکانـدنی ئـێش ۲. ئۆخـەی؛ وشـەیـەک بـۆ پیشاندانی پێخۆش بوون ۳. ☜ **آخ**

**اودوکلنی** / odokolony/': [فرانسوی] ☜ **اُدکُلُن**

**اور** / ûr/': [؟] ☜ **عور**

**اورارتـــویی**[۱] / ûrārtûyî/':/اسـم. ئورارتـــوویی: ۱. /ـها/ خـەڵـکی وڵاتی مێژینـەی ئورارتـوو لـە ئـەرمنـستان و پاڵـداوێنی ئاراراتـەوە هـەتـا زێباری وان لـە تورکیـەدا ۲. زمـان یـان خـەتی ئەو خەڵکە * **اوراتوئی**

**اورارتـــویی**[۲]: صفت. ئورارتـــوویی؛ پێـوەندیـدار یان سەر بە ئورارتوو: **اورارتوئی**

**اوراد** / owrād, 'o:rād/': [عربی] جمعِ ☜ **وِرد**

**اوراق**[۱] / owrāq, 'o:rāq/': [عربی] جمعِ ☜ **وَرَق**

**اوراق**[۲]: صفت. شـەق‌وشـڕ؛ پـەرەپـەرە؛ لێکهەڵوەشاوە؛ ئەوراق. هەروەها: **اوراق بـودن؛ اوراق شدن؛ اوراق کردن**

**اوراقچـــی** / owrāqčî, 'o:rāq-/'، ـهـا/: [عربـی/ ترکـی]/اسـم. ئـەوراقچـی؛ کـەسـێ کـە ماشـینەشـکاو لێـکدەکاتـەوە و بـە جیـا دەیانفرۆشێ.

**اوراقـی** / owrāqî, 'o:rāqî/'، ـهـا/: [عربـی] صـفت. شـەق‌وشـڕ؛ ئـەوراقـی؛ شـیاوی لێک‌کردنەوە و شڕ و شیتاڵ‌کردن.

**اورال‌ـآلتائی** / ûrāl'āltā'î/': **اورال آلتایی**

**اورال ـ آلتـایی** / ûrāl'āltāyî/':/اسم. ئـوراڵـ ئاڵـتایی؛ گروپێکـی گـەورە لـە زمانگـەلی ئاسـیایی و ئورووپـایی کـە بریتیـە لـە زمـانی تـورکی، فینۆئۆیغـوری و مـەغـولی: **اورال‌ـآلتائی**

**اورام** / owrām, 'o:rām/': [عربی] جمعِ ☜ **وَرَم**

**اوران‌اوتـــان** / orān'otān/': [انگلیـسی] ☜ **اُرانگوتان**

**اورانـگ‌اوتـان** / ûrāngûtān/': [انگلیسی] ☜ **اُرانگوتان**

**اورانـــوس** / orānûs, 'ûrānûs/': [فرانـسوی/ انگلیـسی]/اسم. ئورانـووس؛ حـەوتـەمـین گەڕۆکی گەردوونـەی خـۆر (لـە بـاری دووری لـە خۆرەوە).

**اورانـــیم** / ûrānyom, 'orāniyom/': [فرانـسوی] /اسـم. ئۆرانیـۆم؛ تـوخمی کیمیـاوی کـانزایی و ڕادیۆئـەکتیـڤ، لـە دەسـتەی ئاکتینیدگـەل بـە ژمـارەی ئـەتـومی ۹۲ و کێـشی ئـەتـومی ۲۳۸٫۰۲، قـورس و زیۆئاسـا، لـە سروشـتدا بـە شێوەی لێکدراوە هەیە.

**اورت** / overt/': [فرانـسوی] صـفت. [گفتـاری] فـرە؛ یـەکجـار زۆر؛ مـشەمـەر؛ بـێحـەساو: **اوورت**

**اوردویـــسین** / ordovîs(i)yan/': [فرانـسوی] ☜ **اردوویسین**

**اورژانـــس**[۱] / ûrjāns'، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. ئۆرژانس؛ بەشێ لە دامـەزراوەیـەکـی دەرمـانی، کـە کـاری خێـرا پـێڕاگـەیـشتنی برینـداران و نـەخۆشـگەلی نیازمـەنـد بـە چـاوەدێـری زووبـەزوویـە 〈بیمـار را بـه اورژانـس رسـاند: نەخۆشەکەی گەیاندە ئورژانس〉.

**اورژانـس**[۲]: صفت. ئـۆرژانس: ۱. لـە ناچـاری؛ بەپەلە و نێزیـک لـە فـەوتـان 〈اگر کـار اورژانـس داشتی خبرم کُن: ئـەگـەر کـاری بـەپـەلـەت هـەبـوو پـێم بێـژە〉 ۲. [پزشـکی] گرینـگ و بـەپـەلـە 〈بخش اورژانس: بەشی ئورژانس〉.

**اورکـــت** / overkot'، ـهـا/: [انگلیـسی]/اسم. ئۆوێرکـۆت؛ جـۆرێ کـۆتی گـەرم و نیوتـەنـەی تایبەتی زستانانە.

**اورنـــگ** / owrang, 'o:rang/':/اسـم. [ادبـی] تەخـت؛ تـەخـتی پاشـایەتی؛ جێگـای تایبـەتی

دانیشتنی پادشا.

**اوریون** / oryon/': [فرانسوی] ☜ **أرێون**

**اوزالید** / ozālîd/': [فرانسوی/ انگلیسی] ☜ **أزالید**

**اوزان** / owzān, 'o:zān/': [عربی] ۱. جمعِ ☜ **وَزن** ۲. جمعِ ☜ **وَزنه**

**اوزن** / ozon/': [فرانسوی] ☜ **أزُن**

**اوزونبورون** / ûzûnbûrûn, 'ozûnborûn/'، ـها/: [ترکی]/اسم. ماسی خاویار؛ ئوزون بِرون؛ جۆرە ماسیەکی دەریای خەزەرە، گەراکەی دەبێتە خاویار.

**اوژنیک** / ûjenîk/': [؟]/اسم. ئۆژێنیک؛ زانستی باشترکردنی تۆم و تۆرەمەی مرۆڤ و جانەوەر و گیا.

**اوستا** / ûstā/'، ـها/: اسم. [گفتاری] وەستا؛ وسا؛ سوا؛ ئۆسا؛ هۆسا؛ مامۆستا ‹اوستای آهنگر: وەستای ئاسنگەر›.

**اوستا** / avestā/': اسم. ئاوێستا؛ ئەوێستا؛ کتێبی پیرۆزی زەردەشت.

**اوستائی** / avestā'î/' ☜ **اوستایی**

**اوستابدوش** / ûstābedûš/': اسم. قالاوفڕ؛ فڕی ـ فڕی؛ جۆرێ یاری مندالانە کە بە دەوری گەورەترێک (وەستا)دا دادەنیشن، وەستا نێوی گیانداریک دەبا و دەڵێ فڕی، ئەگەر پەلەوەر بێ، هەرکەسێک قامکی بەرز نەکردبێتەوە، سووتاوە یان بە پێچەوانە، تا تاقەکەسێک بمێنێتەوە، ئەوە بەرندەیە.

**اوستایی**[1] / avestāyî/': اسم. ئاوێستایی: ۱. لە زمانە کۆنەکانی ئێرانیە، کە کتێبی پیرۆزی ئاوێستا بەو زمانە نووسراوە ۲. خەتی ئاوێستا * **اوستائی**

**اوستایی**[2]: صفت. ئاوێستایی؛ پێوە ندیدار یان سەر بە ئاوێستا، کتێبی پیرۆزی زەردەشتیان: **اوستائی**

**اوسط** / owsat, 'o:sat/': [عربی] صفت. نێوەنجی؛ مامناوەنجی؛ ناونگ؛ نێوانگین.

**اوصاف** / owsāf, 'o:sāf/': [عربی] جمعِ ☜ **وَصف**

**اوصیا** / owsîyā, 'o:sîyā/': [عربی] جمعِ ☜ **وَصی**

**اوضاع** / owzā', 'o:zā'/': [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **وَضع** ۲. *[گفتاری]* دۆخ؛ بار.

▣ **اوضاع بی‌ریخت شدن**: تێکچوونی کار و بار؛ بار و دۆخ خراپ بوون.

**اوضاع‌واحوال** / owzā'-o-ahvāl, 'o:zā'-/': [عربی]/اسم. *[گفتاری]* بار و دۆخ؛ چۆناوچۆنی کاران، ڕووداوان، ژیان یان باری ساغی.

**اوطان** / owtān, 'o:tān/': [عربی] جمعِ ☜ **وَطَن**

**اوغور** / oqor/': [ترکی] ☜ **أغُر**

**اوف**[1] / ûf/': اسم. *[کودکانە]* بقە؛ ووەە؛ قەقە؛ برین یا نە خۆشی ‹ببین، دستم اف شد: بڕوانە دەستم بقە بوو›.

**اوف**[2]: صوت. وەی؛ ئۆف؛ ئای؛ تەح؛ پەککوو؛ بۆ بێزار بوون بە کار دەچێ ‹اف، چه گرمایی!: وەی، چەند گەرمە!›.

**اوفتادن** / ûftādan/': مصدر. *[ادبی]* کەوتن؛ کەفتن؛ کەوتەی.

**اوقات** / owqāt, 'o:qāt/': [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **وقت** ۲. ڕۆژگار؛ دەم؛ چەل؛ کات؛ کات و سات؛ جاران ‹آن سالها اوقات خوشی بود: ئە و سالانە ڕۆژگارێکی خۆش بوو› ۳. حاڵ و باڵ؛ ئەوقات ‹اوقاتم تلخ شد: حاڵ و باڵم تێکچوو›.

▣ **اوقات فراغت**: کات‌وساتی بەتاڵی.

▣ **اوقات خوش داشتن**: خۆشحاڵ بوون؛ بە دەماخ بیەی؛ کات وساتی خۆش هەبوون.

**اوقات کسی تلخ شدن**: لووت و لاجامان کەسێ تاڵ بوون؛ تووڕە بوون؛ زیز بوون.

**اوقات کسی را تلخ کردن**: کەسێ ئازاردان یان تووڕەکردن.

**اوقـــات‌تلخـــــی** / 'owqāt.talxî, 'o:qāt-/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. ۱. وەڕسـی؛ وەڕەزی؛ وێڕسـی؛ جـاڕزی؛ دڕدۆنگـی؛ ناخۆشـی ۲. تووڕەیـی؛ دەنـگ هـەڵـبڕی؛ مژومـۆڕی؛ گـرژ و مـۆنی؛ زیـزی؛ زووری؛ زوێـری؛ رووگـرژی؛ ناوچاوتاڵـی؛ زیـزی؛ ناقـایلی ‹حوصـلەی اوقـات‌تلخـی رییـس را نـدارم: تاقـەت تـووڕەیـی سەرۆکم نیە›.

**اوقـــاف** / 'owqāf, 'o:qāf/: [عربـی] ۱. جمـع ☜ **وَقف**

**اوکـــالیپتوس** / 'okālîptûs/: [فرانـسوی] ☜ **اُکالیپتوس**

**اوکـــی** / 'okey/: [انگلیـسی]/اسـم. ئـەرێیانـە؛ ئەرێ؛ باشە ‹بایـد از رییس اوکـی بگیـرم: دەبـێ لـە سەرۆک نەرێیانە وەرگرم›.

**اول**[1] / 'avval، ـــهـا؛ اوایـل/: [عربـی]/اسـم. سـەرەتـا؛ سـەر؛ هـەوەڵ؛ ئـەوەڵ؛ ئـەوەڵ؛ دەسپێک؛ وەر؛ ئـەوەی کـە لـە جـێ و شـوێنا لـە بەر هەموانەوەیە ‹اول شب: سەرەتای شەو›.

▣ **اول بسم‌الله**: [کنایی] سەرەتای کاروبار.

**اول**[2]: صفت. یەکـەم: ۱. سـەرەتـایین؛ هـەوەڵ؛ بە پێشیەتی لـە ڕێ و جـێ یـان کاتێکـدا ‹شب اول: شـەوی یـەکـەم› ۲. باشـتر و پێـشتر لـە کەسانی دیکە ‹نفر اول: کەسی یەکەم›.

▣ **اول بـودن**: لـە سـەرەوە بـوون؛ پـشت لـە گـشتی بـوون؛ باشـتر یـا پێـشتر لـە هـەمـوو بـوون؛ لـە وەر بـین؛ هـەڵـکەوتـوو بـوون؛ هۆرئامە بیەی. هەروەها: **اول شدن**

**اول**[3]: قیـد. ۱. هـەوەڵ؛ یـەکـەم؛ سـەرەتـایی؛ لەبەرا؛ لەبـەردا؛ وەڵـێنە؛ پـێش لـە کـەس یـان کـەسـانی‌تـر ‹اول مـن دیـدم: هـەوەڵ مـن دیـتم› ۲. سـەر؛ سـەرەتـا ‹اول شـب، بـرق رفـت: سـەری شەو بەرق چوو›.

**اولا** / 'avvalan/: [عربـی]قیـد. سـەرەتـا؛ ئەوەڵای ئەوەڵ؛ پـێش هـەرشـتێک؛ لـە پێـشدا ‹اولا، او باید برود: سەرەتا، دەبێ ئەو بڕوا›.

**اولاد** / 'owlād/: [عربـی]/اسـم. ۱. منـداڵان؛ منـداڵان؛ ڕۆڵان؛ زارۆکـان؛ زاوڵـەکـا؛ زاوڵـێ؛ زاوڵـەکـێ؛ زارۆڵـێ ‹اولاد وطـن: منداڵانـی نیـشتمان› ۲. فـرزەنـد؛ ڕۆڵـە؛ منـاڵ؛ منـداڵ؛ زاوڵە؛ فرزەن ‹اولاد ارشد: منداڵی گەورەتر›.

▣ **اولاد ارشـد**: بـەرەزا: ۱. گـەورەتـرینی منداڵان ۲. منداڵی گەورەتر.

**اولاد اولیاء**: وجاخزادە؛ بەچکە شێخ.

**اولتراســـونوگرافی** / 'ûltrāsonog(e)rāfî/: [فرانسوی] ☜ **سُونُوگرافی ـ۱**

**اولتراســـونیک** / 'ûltrāsonîk/: [فرانـسوی] صفت. سـەرووی دەنـگ؛ دەنگـی وا کـە بـڕێ گیانداران (وەک ئەسـپ و گـا) دەیبیـسن، بـەڵام مرۆ پێ نازانێ.

**اولتراویولـــت** / 'ûltrāviyolet/: [انگلیـسی] اسـم. سـەرووی بـەنـەوش؛ تیـشکی بـانتر لـە بنەوش کە مرۆ نایبینێ.

**اولتیمـــاتوم** / 'oltîmātom/: [فرانـسوی] ☜ **اُلتیماتُوم**

**اول‌شـخص** / 'avvalšaxs، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. یەکەم کـەس: ۱. [دستور] کـەسێک کـە قـسە ئـەکـات ‹«مـن» ضـمیر اول شـخص مفـرد اسـت: «مـن» جێنـاوی یـەکـەم کـەسـی تاکـە› ۲. [مجـازی] بـەرزتـرین و سـەرەکـی‌تـرین کەسایەتی لە وڵاتدا.

**اولویـــت** / 'owlavîyyat, 'o:lavîyyat، ـهـا/: [عربی]/اسم. یـەکـەمایـەتی؛ یـەکـەمـینی؛ بـار و دۆخ یان چۆنیەتی بـەر لـە ئـەم و ئـەوەوە بـوون ‹اولویت با اوست: یەکەمایەتی بە ئەوە›.

**اولهـا** / 'avvalhā/: [عربی]قیـد. ئـەوەڵ؛ لـە بەرا؛ سەرەتـا؛ لـە سـەرەتـادا؛ لـە پێـشوودا؛ چـا وەڵاوە؛ وەڵـێنە؛ لـە قۆنـاغی سـەرەتـایی دەورەیەکدا ‹اولها مردم بـا هـم زیـاد ارتبـاط داشـتند: سەرەتا خەڵک پەیوەندییان زۆر پێکەوە بوو›.

**اولی** / 'owlā, 'o:lā/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ١. چاکتر؛ باشتر؛ خاستر؛ خاستەر ‹بە طریق اولی: بە شێوازێکی چاکتر› ٢. لە بار؛ شیاو ‹او بە ریاست اولی‌تر است: ئەو بۆ سەرۆکایەتی شیاوترە›.

**اولی** / 'avvalî، ـها/: [عربی] ضمیر. هەوەڵین؛ ئەوەڵی؛ وەڵین؛ بەروو؛ پێشوو؛ نمفوو؛ ئەو کەسەی کە لە ڕیز و قۆناغ، لە جێگەی هەوەڵدا بێت ‹اولی رفت، بقیه ماندند: هەوەڵینیان چوو، باقی مانەوە›.

**اولیا** / 'owliyā, 'o:liyā/: [عربی] *اسم.* ١. جمعِ ☜ **ولی** ٢. سەرپەرستان ٣. پیاوانی‌خوا؛ پیران؛ گرگران؛ ئەولیا.

▣ **اولیای امور**: ١. کارداران؛ ئەو کەسانەی کە پێ‌ڕاگەیشتنی کارگەل وەدەستیانە ٢. *[مجازی]* دەسەڵاتداران.

**اولیاالله** / 'owliyā'allāh, 'o:liyā- /: [عربی] *اسم.* ئەولیا؛ پیاو چاک؛ پیر؛ پیاو چاکی خوا.

**اولیات** / 'avvalîyyāt/: [عربی] *اسم. [منطق]* ڕاستیە بێ‌شکەکان (وەک ڕۆژ ڕۆشنە تەڕ و وشک پێکەوە نابن) کە دروستن و دروستیان نیازی بە سەلماندن نیە و دەبنە بەردی بناغەی قسەوە.

**اولین** / 'avvalîn، ـها/: [عربی] *صفت.* یەکا؛ یەکەمین؛ ئەوەڵین؛ هەوەڵین؛ وەڵین؛ وەرین؛ بەرین.

**اولیه** / 'avvalîy.ye/: [عربی] *صفت.* ١. سەرەتایی ‹قدمهای اولیه: هەنگاوگەلی سەرەتایی› ٢. سەرەتایین؛ هەوەڵین؛ بەرین؛ وەڵین ‹مراحل اولیه: قۆناغگەلی سەرەتایی›.

**اوماج** / 'omāc/: [ترکی] *اسم.* پەڵو؛ پرپۆڵە؛ پەڵوڵە؛ جوجوش؛ چێشتی ئارد و ڕۆن؛ چێشتێکە وردە هەویر و کووزەڵەی تێ‌دەکەن.

**اومانیست** / 'ûmānîst، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* مرۆڤەوگر؛ مرۆڤۆگر؛ مرۆڤخواز.

**اومانیسم** / 'ûmānîsm/: [فرانسوی] *اسم.* مرۆڤەوگەری؛ مرۆڤۆگری؛ مرۆڤخوازی: **انسانگرایی**

**اونس** / 'ûns/: [فرانسوی] *اسم.* ئونس؛ یەکەی پێوانی کێش بەرامبەر بە ٢٨,٣٥ گرەم: **أنس**

**اونیتاریانیسم** / 'ûnîtāryānîsm/: [فرانسوی] *اسم.* تاکەپەرستی؛ یەکخودایی.

**اونیفورم** / 'ûnîform/: [فرانسوی] ☜ **أنیفُرم**

**اوورت** / uvert/: [فرانسوی] ☜ **أورت**

**اوول** / 'ovûl، ـها/: [فرانسوی] *اسم. [زیست‌شناسی]* هێلکۆکە؛ تۆمی مێوینە.

**اوه** / 'ûh/: *صوت.* وەی؛ ئۆف؛ ئۆی؛ ئاخ؛ وشەیەک کە لە کاتی ئێش، خۆشی یان سەیرماندا دەگوترێ ‹اوه سوختم!: وەی سووتام!›.

**اوهام** / 'owhām, 'o:hām/: [عربی] جمعِ ☜ **وَهم**

**اوهام‌پرستی** / 'owhāmparastî, 'o:hām- /: [عربی/ فارسی] *اسم.* خەیاڵپەرستی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی باوڕ بە بوونەوەری خەیاڵی و ناڕاستی و پەرستینیان.

**اوی** / 'oy/: *صوت. [مخفف]* ئوهۆی؛ هۆی؛ هۆ؛ وە.

**اویار** / 'owyār, 'o:yār/: *اسم.* ١. ئاویار؛ ئاودار؛ ئاودێر؛ ئاودەرد ٢. ئۆیار؛ قاوانەی لاوە لادێیەکانی ناوەندی ئێران ‹اویار تقی: ئویار تەقی›.

**اویغور** / 'oyqûr/: [ترکی] ☜ **أیغور**

**اویغوری** / 'oyqûrî/: [ترکی] ☜ **أیغوری**

**اویماق** / 'oymāq/: [ترکی] *اسم. [نامتداول]* ١. ئێڵ؛ خێڵ؛ هۆز ٢. هەرێمی ئێڵ؛ تەراتێنی خێڵان؛ نشینگەی گەلان؛ بەردەستی هۆزان ❋ **أیماق**

**اه** / 'ah/: *صوت.* یەع؛ ئەع؛ عەع؛ ئیش؛ پیف؛ پف؛ ویژەیەک کە بە هۆی بێزهاتنەوە لە شتێک دەگوترێ ‹اه، چە بوی بدی می آید!: پیف، چ بۆنێکی پیس دێ!›.

**اهالی** / ahālî/: [عربی] *اسم.* خەڵکان؛ خەڵکی؛ مەردمەیل؛ خەڵکی گەڕەک یان دەڤەرێک.

**اهانت** / ehānat'، ـها/: [عربی] *اسم.* سووکایەتی؛ پەتپەتێن؛ بێحورمەتی؛ کار یا ڕەوتی سووکایەتی پێکردن ‹بە علت اهانت بە مقامات توقیف شد: بە بۆنەی سووکایەتی (کردن) بە گەورە بەرپرسان گیرا›.

**اهانت‌آمیز** / ehānatāmîz'/: [عربی/ فارسی] *صفت.* کەتندار؛ هاوڕێ لەگەڵ سووکایەتی؛ سووکایەتی‌هێنەر: **اهانت‌بار**

**اهانت‌بار** / ehānatbār'/: [عربی/ فارسی] ☜ **اهانت‌آمیز**

▣ **اهانت کردن و آزار دادن**: پەتپەتی بەسەر هێنان؛ سووکایەتی پێ‌کردن.

**اهای** / ahāî'/: *صوت. [گفتاری]* هۆ؛ هۆی؛ ئەهای؛ هەیو: ۱. بانگ‌کردنی دوور ‹اهای بچەها! جلوتر نروید: هۆ کورینە! مەچنە پێشترەوە› ۲. بانگ‌کردنی بە تووڕەیی و تەشەرەوە ‹اهای مَرد! خجالت بکش: هۆ کابرا! داڕزە› ۳. قاودان؛ هەموو بەخەبەرکردن ‹اهای دُزد: هۆی دز هاتووە›.

**اهتزاز** / ehtezāz'/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. ڕەوتی جوولانەوە؛ شەکانەوە؛ شنانەوە؛ هەژان؛ ڕاژان؛ هەژهان؛ قەلقان؛ ئەوەشۆکیەی؛ لەریایوە ۲. *[نامتداول]* شادمانی.

**اهتمام** / ehtemām'/: [عربی] *اسم.* جەخت و بەخت؛ کردوکۆش؛ تەپشت؛ هەڵگ؛ کار یان ڕەوتی تێکۆشان؛ بایەخدان؛ گرنگی‌پێدان.

**اهدا** / ehdā'/: [عربی] *اسم.* بەخشش؛ پێشکەش ‹اهدای خون: بەخششی خوێن›.

▣ **اهدا کردن**: پێشکەش‌کردن؛ پێدان. هەروەها: **اهدا شدن**

**اهدائی** / ehdā'î'/: [عربی] ☜ **اهدایی**

**اهداف** / ahdāf'/: [عربی] جمعِ ☜ **هَدَف**

**اهدانامه** / ehdānāme'، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* دیاری‌نامە؛ نووسراوەیەک کە بە پێی ئەوە شتێک بە کەس یان کەسانێک بدرێت.

**اهدایی** / ehdāyî'/: [عربی] *صفت.* پێشکەش‌کراو؛ پێشکەشی: **اهدائی**

**اهرام** / ahrām'/: [عربی] جمعِ ☜ **هِرَم**

**اهرم** / ahrom'، ـها/: [عربی] *اسم.* مەڵغە؛ مەلغە؛ ماڵیلە؛ مانیلا؛ کوسکی؛ لۆسە؛ لۆس؛ لهازە؛ لێهاز؛ لیهاز؛ لەواز؛ لەوازە؛ لایز؛ وازە؛ برازە؛ بەرازە؛ باریە؛ باری؛ پاریە؛ بەیرەم؛ نوێڵ؛ دەلەم؛ کەڕانە؛ قەراسە: ۱. میلە یان چێوێکی بەرز و پتەو کە لە جێیەکدا سەقامی دەدەن و شتی قورس و گرانی پێ لادەدەن ۲. هەر دەزگایەک کە بۆ گۆڕانی باری هێز یان زۆرکردنی چەندی یا مەودا و خێرایی شوێنەواری هێز بەکەڵک بێت ۳. *[مجازی]* ئامراز و داردەستی تێرۆکردن یان تێ‌پەستاوتنی هێز ‹اهرم اقتصادی؛ اهرم سیاسی: لوسەی ئابووری؛ لوسەی ڕامیاری›.

**اهریمن** / ahrîman'، ـها؛ ـان/: *اسم. [ادبی]* ئاهریمەن؛ ئەهریمەن؛ ئاوریمەن؛ دۆزاک؛ شەیتان: ۱. هۆی خراپی، ستەم، نەخۆشی و نەگریسی لە ئایینە ئێرانیەکاندا ۲. *[مجازی]* هەرکام لە پەیڕەوانی ئاهریمەن؛ هەر کەسێ کە خراپە و ستەم دەکا.

**اهریمن‌خو** / ahrîmanxû'، ـیان/: *صفت. [ادبی]* شەیتان‌سیفەت؛ خاوەنی ڕەوشتی شەیتانی.

**اهریمنی** / ahrîmanî'/: *صفت. [ادبی]*

ئاهریمەنی؛ ئەهریمەنی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئاهریمەن.

**اهل** / ahl'/: [عربی] *صفت*. خاوەن هێزایی بۆ کارێ یان شتێک.

**اهل** / ahle'/: [عربی] *حرف*. ۱. خەڵک؛ دانیشتوو؛ نیشتەجێ ‹اهل جنوب: خەڵکی باشوور› ۲. ئەهل؛ خاوەن؛ خوازیار و گیرۆدە بە شتێکەوە ‹اهل قلم؛ اهل سیاست: خاوەن قەڵەم؛ ئەهلی رامیاری›.

▣ **اهل بخیه:** فەشەل؛ پووڵەکی؛ ناماقووڵ.

**اهل بیت:** ۱. ماڵبات؛ خاوخێزان (بە تایبەت ژن و منداڵ)؛ خانەوادە؛ بنەماڵە ۲. هۆزی پێغەمەری ئیسلام.

**اهل تسنن:** سوننی؛ ئەو دەستە لە موسوڵمانان کە ئێژن پێغەمبەری ئیسلام جێگری بۆ خۆی دانەناوە و خەڵکی دەبێ خۆیان ڕێبەریان هەڵبژێرن.

**اهل تشیع:** شیعە؛ شێعە؛ ئەو دەستە لە موسوڵمانان کە ئێژن پێغەمبەری ئیسلام جێگری بۆ خۆی داناوە و خوا بۆیانی هەڵبژاردووە.

**اهل تعارف:** خوڵکی؛ کەسێ کە دەبێ زۆر خولکی بکەی.

**اهل حال:** *[کنایی]* حاڵەکی؛ خۆشبوێر؛ خۆشی و کەیف ویست.

**اهل حق:** هەق؛ هەقە؛ هەقی؛ یارسا؛ یارسانان؛ کاکەیی؛ نوالە؛ ئەهلی حەق؛ چەند تیرەیەکی کوردن کە ئایینێکی تایبەتیان هەیە.

**اهل دل:** *[کنایی]* دڵیار؛ دڵەکی؛ ئەهلی دڵ؛ خاوەن دڵ؛ دڵانی.

**اهل ذمّە:** کەسانێک وا لە ولاتی ئیسلامیدان، بەڵام دینێکی تریان هەیە.

**اهل قبور:** مردوان؛ لە گۆڕ جێگرتوان.

**اهل قلم:** نووسەر؛ ئەهلی قەڵەم؛ خاوەن قەڵەم؛ قەڵەمڵا؛ قەڵەم بەدەست.

**اهل کتاب:** *[اسلام]* پەیڕەوانی پەرتووکی ئاسمانی.

**اهل محل:** خەڵکی گەڕەک؛ دانیشتوانی گەڕەک.

**اهل منقل:** *[کنایی]* تریاکی؛ تلیاکی؛ بەنگی؛ بافووری.

**اهل نظر:** خاوەن ڕا؛ خاوەن بڕوا و ئاگاداری لە بوارێکدا.

**اهل‌وعیال** / ahl-o-'ayāl'/: [عربی] *اسم*. خاوخێزان؛ بنەماڵە؛ کەسانی حەوێندراو لە ماڵێکدا (بەتایبەت ژن و منداڵان) کە کەسێک سەپەرستیانە.

**اهله** / ahelle'/: [عربی] جمعِ ☜ **هِلال**

▣ **اهلەی قمر:** شێوەگەلێک کە مانگ لە ڕەوتی خولانەوەی مانگانەی خۆی بە دەوری زەویدا، لە چاو بینەرێکی زەوینیەوە دەیگرێتە خۆ.

**اهلی** / ahlî'، ـها/: [عربی] *صفت*. کەوی؛ کەڤی؛ کەهی؛ کەیی؛ کوی؛ ماڵی؛ ڕام؛ لینی؛ دەسەمۆ؛ خانەکی؛ گورۆ؛ فێرەبووی خۆگرتگ؛ هۆگرتی بە مرۆ و ژینگەکەی (بۆ گیانلەبەران).

▣ **اهلی کردن:** کەوی کردن؛ لینی کەردەی؛ بەیدەست کردنی گیانلەبەری کێوی.

هەروەها: **اهلی بودن؛ اهلی شدن**

**اهلیت** / ahlîyyat'/: [عربی] *اسم*. ۱. شیاوی؛ لەباری ۲. *[گفتاری]* ڕەسەنی؛ بنەچەکی؛ خەڵکی شوێنێک بوون.

**اهم** / aham(m)'/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* گرینگ تر؛ گرنگتر ‹اهم موضوعات: بابەتگەلی گرینگتر›.

**اهمال** / ehmāl'/: [عربی] *اسم*. سستی؛ سسی؛ ئاوەرە؛ تەفرە؛ کەمتەرخەمی؛ خۆلێبوێری؛ خۆگێلکەری؛ قۆنەقۆن؛

گەللایی؛ لامسەرلایی؛ پاوەپایی؛ خەمتنە؛ شەرڤیرن؛ ڤەگوهێشن.

▣ **اهمال کردن:** گوێ خەفاندن؛ تەمبەلی کردن؛ کەمتەرخەمی کردن؛ خستنە پشت گوێ؛ گوێ لێ ئاخنین؛ خێشاندن؛ وەدرەنگ خستن؛ پاش‌خستن؛ خۆ لێ گێل کردن؛ پایە نەبوون. هەروەها: **اهمال ورزیدن**

**اهمال‌کار** / 'ehmālkār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. خەنۆک؛ کەمتەرخەم؛ لەشگران؛ گوێ‌نەدەر؛ خۆ لێ‌بوار؛ بێ‌سەرنج؛ خێشانکار. هەروەها: **اهمال‌کاری**

**اهمیت** / 'ahammîyat/: [عربی]/اسم. گرنگی؛ گرینگی؛ گرنگ؛ گرنگایەتی؛ بایەخداری؛ گەم؛ گرانە؛ ئەنێشت؛ پایەی؛ دۆخ یان چۆنیەتی گرنگ بوون.

▣ **اهمیت پیدا کردن** ☜ **اهمیت یافتن**

**اهمیت دادن:** گرنگی پێدان؛ بە گرینگ زانین؛ پایەی بوون ‹من به این چیزها اهمیت نمی‌دهم: بەم شتانە گرنگی نادەم›.

**اهمیت داشتن:** گرینگ بوون؛ گرنگ بوون ‹این نکته بسیار اهمیت دارد: ئەم خاڵە زۆر گرینگە›.

**اهمیت ندادن:** *[گفتاری]* گوێ نەدان؛ گوێ پێ‌نەدان؛ گوێچکە نەلەقیان؛ لووت لاوە گردن ‹مهم نیست، اهمیت نده: گرینگ نیە، گوی مەدەری›.

**اهمیت یافتن:** گرینگ بوونەوە؛ گرنگی پەیدا کردن: **اهمیت پیدا کردن**

**اهن و تلپ** / 'ehen(n)-o-tolop/: اسم. *[گفتاری]* قروفر؛ ئینجەوفینجە؛ جوولانەوە بە مەبەستی خۆ نواندن و سەرنجی دیتران بەرەو لای خۆ ڕاکێشان ‹آقای مدیر با اهن و تلپ وارد کلاس شد: ئاغای مودیر بە قروفرێکەوە هاتە کەلاس›.

**اهوی** / 'ohoy/: صوت. *[گفتاری]* هۆ؛ هۆی؛ ئۆی؛ وشەیەک بۆ بانگێشتن یان هۆشیاری دان بە تۆزێ سووکایەتیەوە ‹اهوی کجا؟: هوی بۆ کوێ؟›.

**اهه** / 'ehe/: صوت. *[گفتاری]* پەکوو؛ ئەک؛ دەک؛ ئەها؛ ئا؛ ئەحەی؛ وشەیەک بە نیشانەی سەرسوورمان ‹اهه، ببین به چه روزی افتادی: پەکوو، بڕوانە چت لێ قەوماوە›.

**ای** / 'ay/: صوت. *[ادبی]* ئەهای؛ های؛ ئەی؛ هۆ؛ وشەیەک بۆ بانگهێشتن یان ئاوڕدانەوە ‹ای مردم!: ئەهای خەڵکینە!›.

**ای** / 'e:y/: صوت. *[گفتاری]* ۱. ئەی؛ هۆی؛ یا؛ هۆ؛ هە؛ ئا؛ ئە؛ وشەیەک بۆ پەسندکردن و بۆ هاوارایی ‹ای بد نیست؛ ای می‌گذرد: ئەی خراو نیە؛ ئەی دەگوزەرێ› ۲. ئەرێ؛ وشەی هەڵسەنگاندن ‹ای، ده‌سالی می‌شود که او را ندیده‌ام: ئەرێ، دەساڵێک ئەبێ نەمدیوە›.

**ایا** / 'ayā/: [عربی] صوت. *[ادبی]* هۆ؛ ئەی؛ ئەرێ؛ وتەی بانگهێشتن ‹ایا برادر رهگذر: هۆ کاکی ڕێبوار›.

**ایاب و ذهاب** / 'iyāb-o-zahāb, 'ayāb-/: [عربی]/اسم. هاتوچوو؛ هاتوچۆ؛ ئاموشۆ؛ ئامشۆ؛ ئامەولوەی ‹این همه هزینه‌ی ایاب‌وذهاب؟: ئەم هەمووە خەرجی هاتوچۆ؟›.

**ایادی** / 'ayādî/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ۱. دەستان؛ دەسان؛ دەسێ ۲. دەست و پێوەندان؛ هاودەسان؛ هاودەستان و کار ڕێخەران ‹ایادی انگلیس: دەست و پێوەندانی ئینگلیس›.

**ایار** / 'ayār/: [سریانی]/اسم. ئەیار: ۱. مانگی پێنجەمی ساڵی هەتاوی وڵاتانی عەرەبی کە ۳۱ ڕۆژە و بەرانبەر بە مانگی مەی زایینیە ۲. مانگی هەشتەمی ساڵی عورفی و مانگی دووەمی ساڵی جوولەکە کە ۲۹ ڕۆژە.

**ایاز** / 'ayāz/: اسم. *[گفتاری]* شیبا؛ شنە؛

سروە؛ بای بسکان؛ شنەبا؛ ئەیاز.

**ایاغ** / 'ayāq/: [ترکی]/اسم. [قدیمی] ۱. جامی شەراب ۲. دەفری ڕۆن.

**ایاق** / 'ayāq/: [ترکی]/اسم. [گفتاری] دەسەبرا؛ هاودەسە؛ کەسێ کە لە کارێک، بەتایبەت گەڕان و سەیراندا هاوڕێ و هاودە نگە ‹زمانی با جاهلهای محله ایاق بودیم: سەردەمێک دەسەبرای جحێلانی گەڕەک بووین›. هەروەها: **ایاق بودن؛ ایاق شدن**

**ایالات** / 'eyālāt, 'îyālāt/: [عربی] جمعِ ☜ **ایالَت**

**ایالت** / 'eyālat, 'îyālat، ـها؛ ایالات/: [عربی] اسم. ۱. [قدیمی] پارێزگا؛ پارێزگە ۲. [قدیمی] پارێزگاری ۳. ئەیالەت؛ هەرکام لە ولاتگەلی ئەندام لە دەولەتێکدا (وەک ئەیالەتگەلی سوویس، ئالمان و ئەمریکا).

**ایالتی** / 'eyālatî, 'îyālatî/: [عربی] صفت. ئەیالەتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئەیالەت ‹دانشگاه ایالتی: زانستگای ئەیالەتی›.

**ایام** / 'ayyām/: [عربی]/اسم. [ادبی] ڕۆژان: ۱. روان؛ ڕوێ ‹ایام هفته: ڕۆژانی حەوتوو› ۲. سەردەم؛ ڕۆژگار ‹ایام جوانی: ڕۆژگاری لاوەتی›.

▣ **ایام بوقلمون**: [کنایی] ڕۆژگاری شێواو و دانەمەزراو.

**ایام تعطیل**: ڕۆژانی پشوودان.

**ایام مبادا**: ڕۆژتەنگ؛ کاتی تەنگانە؛ ڕۆژگەلی تەنگی و چەلەمەیی.

**ایپریت** / 'îperît/: [فرانسوی/ انگلیسی]/اسم. ئیپریت؛ دووکەلی خەردەل؛ دووکەلێکی کیمیاویە، لە هەلەبجە خەلکیان پێ کوشت.

**ایپکا** / 'îpekā، ـها/: اسم. گورگەکوژە؛ گریەکوشە؛ بتەیێکە هاوینان هەلدەداتەوە و بنەکەی بۆ دەرمان ئەشێ.

**ایتالیائی** / 'îtāl(i)yā'î/ ☜ **ایتالیایی**

**ایتالیایی**[1] / 'îtāl(i)yāyî/: اسم. ئیتالیایی: ۱. لە زمانگەلی ڕۆمی کە لە ولاتی ئیتالیادا باوە ۲. ـها؛ ـان/ هەرکام لە خەلکانی ئیتالیا یان زارۆکانیان * **ایتالیایی**

**ایتالیایی**[2]: صفت. ئیتالیایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ولاتی ئیتالیا ‹کفش ایتالیایی: کەوشی ئیتالیایی›: **ایتالیایی**

**ایتالیک** / 'îtālîk/: [فرانسوی] ☜ حروف ایتالیک، **حروف**

**ایتام** / 'îtām/: [عربی] جمعِ ☜ **یَتیم**

**ایتربیم** / 'îterbiyom/: [فرانسوی]/اسم. ئیتێربیۆم؛ توخمێ کیمیاوی کانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان، بە ژمارەی ئەتومی ۷۰ و کێشی ئەتومی ۱۷۳،۰٤ کە بە شێوەی تێکئالاو لەگەل توخمەکانی تر لە سروشتدا هەیە.

**ایتریم** / 'îteryom/: [فرانسوی]/اسم. ئیتێریۆم؛ توخمێ کیمیاوی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ۳۹ و کێشی ئەتومی ۸۸،۹ کە لە سروشتدا بە شێوەی تێکئالاو لەگەل برێک توخمەکانی تردا هەیە.

**ایثار** / 'îsār، ـها/: [عربی]/اسم. لە خۆ بوردوویی؛ گیان بەختکەری؛ گیانفیدایی.

**ایثارگر** / 'îsārgar، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. گیانفیدا؛ خۆ بەختکەر؛ خاوەن خووی لە خۆ بووردن.

**ایثارگری** / 'îsārgarî، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. لە خۆ بوردوویی؛ خۆ بەختکری؛ کار و ڕەوتی گیان بەختکردن؛ خۆ بەفیدای دیتران کردن.

**ایجاب** / 'îcāb/: [عربی]/اسم. ۱. پێویستی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی پێویست بوون ۲. [نامتداول] وەرگرتن ۳. [منطق] دامەزراوی؛ سەلمانی واتە بۆ بنەمای قسە. بەرانبەر: **سَلب**

⊡ **ایجاب کردن**: خواستن؛ پێویستکردن؛ واسەی ‹وضع اقتصادی کشور، ایجاب می کرد برخی کالاها جیرەبندی شود: باری ئابووری ولات دەیخواست بەرێک لە کالاگەل جیرەبەنی بکرێن›.

**ایجاد** / îcād/': [عربی]/اسم. ١. یابە؛ بنیات؛ ئیجاد؛ سازدەری؛ پێکهێنەری؛ داهێنەری ٢. *[نامتداول]* کار یان ڕەوتی خولقاندن؛ وەش کەردەی؛ وەدیهێنان؛ چێکرن.

⊡ **ایجاد شدن**: وەدی هاتن؛ دروست بوون ‹وسط کوچه چالەی بزرگی ایجاد شده بود: لە ناوەڕاستی کۆڵانەکەدا کەندێکی گەورە وەدی هاتبوو›. هەروەها: **ایجاد کردن**

**ایجاز** / îcāz/': [عربی]/اسم. ١. کورتبڕی ٢. دەربڕینی بڕوا بە کورتی بەستە و بە کەمی ڕستە.

**ایدآل** / îde'āl/': [فرانسوی] ☜ **ایدەآل**

**ایدئولژی** / îde'olojî/'، ـها/: [فرانسوی]/اسم. بیروبڕوا؛ مەرام ‹ایدئولژی اسلامی: بیروبڕوای ئیسلامی›: **ایدئولوژی**

**ایدئولژیست** / îde'olojîst/': [فرانسوی] ☜ **ایدئُولُوگ**

**ادیئولژیک** / îde'olojîk/': [فرانسوی] *صفت.* بیرۆکوانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە بیروباوەڕ.

**ایدئولوژی** / îde'olojî/': [فرانسوی] ☜ **ایدئُولژی**

**ایدئولوگ** / îde'olog/'، ـها/: [فرانسوی]/اسم. بیرۆکوان؛ خاوەنبیر: **ایدئولژیست**

**ئیدرات** / îdrāt/': [فرانسوی] ☜ **هیدرات**

**ئیدراته** / îdrāte/': [فرانسوی] ☜ **هیدراته**

**ئیدراسیون** / îdrās(i)yon/': [فرانسوی] ☜ **هیدراسیون**

**ئیدروالکتریک** / îdro'elektrîk/': [فرانسوی] ☜ **هیدروالکتریک**

**ئیدروتراپی** / îdrot(e)rāpî/': [فرانسوی] ☜ **هیدروتراپی**

**ئیدروتروپیسم** / îdrot(e)ropîsm/': [فرانسوی] ☜ **هیدروتروپیسم**

**ئیدروژن** / îdrojen/': [فرانسوی] ☜ **هیدروژن**

**ئیدروژناسیون** / îdrojenās(i)yon/': [فرانسوی] ☜ **هیدروژناسیون**

**ئیدروژنش** / îdrojeneš/': [فرانسوی] ☜ **هیدروژنش**

**ئیدروژنه** / îdrojene/': [فرانسوی] ☜ **هیدروژنه**

**ئیدروستاتیک** / îdrostātîk/': [فرانسوی] ☜ **هیدروستاتیک**

**ئیدروسفالی** / îdrosefālî/': [فرانسوی] ☜ **هیدروسفالی**

**ئیدروسفر** / îdrosfer/': [فرانسوی] ☜ **هیدروسفر**

**ئیدروفویل** / îdrofoyl/': [فرانسوی] ☜ **هیدروفویل**

**ئیدروفیل** / îdrofîl/': [فرانسوی] ☜ **هیدروفیل**

**ئیدروکربن** / îdrokarbon/': [فرانسوی] ☜ **هیدروکربن**

**ئیدروکربور** / îdrokarbûr/': [فرانسوی] ☜ **هیدروکربور**

**ئیدرولژی** / îdrolojî/': [فرانسوی] ☜ **هیدرولژی**

**ئیدرولیک** / îdrolîk/': [فرانسوی] ☜ **هیدرولیک**

**ئیدرومتر** / îdrometr/': [فرانسوی] ☜ **هیدرومتر**

**ئیدرید** / îdrîd/': [فرانسوی] ☜ **هیدرید**

**ایدز** / eydz/': [انگلیسی]/اسم. *[پزشکی]* ئەیدز؛ نەخۆشینی لەکار کەوتنی هێزی چارەسەرکاری ناکۆکی لەش، کە زیاتر بە بۆنەی سەرجێیی کردن لەگەڵ نەخۆش یان لە خوێنی نەخۆشەوە مرۆ تووشی دەبێ.

**ایدزی** / eydzî/'، ـها/: [انگلیسی] *صفت.* ئەیدزی؛ نەخۆش کەوتوو بە ویرووسی ئەیدز.

**ایــــده** / 'îde، ــــهــــا/: [فرانـــسوی]/اســـم. ۱. ئەندێشە؛ بیر؛ ڕا؛ باوەڕ؛ داڵـغە؛ گاڤـین؛ هـەنی ۲. [فلسفه] وێنە؛ نموونە.

**ایــدەآل** / 'îde'āl، ـــهــا/: [فرانـسوی]/اسم. ۱. ئارمان؛ دۆز؛ گاڤـین؛ کاربـەنـد؛ مـەبـەسـت لـە ژیانـدا بـەباشـترین جـۆر ‹ایـدەآل جوانـان امـروز: ئارمـانی لاوانی ئـەمـڕۆ› ۲. پڕبـەدڵ؛ بـاوی دڵ؛ تەواو دڵـخواز ‹ایـن خانـە ایـدەآل اسـت: ئـەم ماڵـە پڕبەدڵە›.

**ایــدەآلیــست** / 'îde'ālîst، ـــهــا/: [فرانـــسوی] صفت. ئارمـانوان؛ ئیـدئالیـست: ۱. ئارمـانخواز؛ بـە شـوێنڕۆی ئیدئالیـسم ۲. خـەیـاڵپـەروەر؛ خەیالاتی.

**ایــدەآلیــسم** / 'îde'ālîsm/: [فرانسوی]/اسم. ۱. ئارمـانخوازی؛ ڕوانگـەیـەکـی فـەلـسەفی کـە چۆنـاوچۆنی تێگـەیـشتنی مـرۆڤ لـە جیهـانی مـادی، بـە هۆکـاری تـێڕوانـین و بیرگـەلی پێـشوو دەزانـێ کـە لـە مێـشکدایە: **اصـالت تـــصور؛ اصـــالت فکـــر؛ اصـــالت معنـــی** ۲. ڕوانگەیێکی فـەلـسەفی کـە مـاک بـە چێکـراوە و دنیـاش بـە دامـەزراوەیـەک دەزانـێ کـە تـا سەر نیە ۳. [مجازی] خەیاڵپەرستی.

**ایـــــذا** / 'îzā/: [عربـــی]/اســـم. [ادبـــی] چـــەرمـــەســـەری؛ ئـــازار؛ کـــار یـــان ڕەوتی چـەرمـەسـەری دان و ڕەنجانـدن؛ گـەهرانـدن؛ ئاراندن ‹دست از ایذای دیگـران بـردار: دەسـت لـە ئازاری خەڵک هەڵگرە›.

**ایذائی** / 'îzā'î/: [عربی] ☜ **ایذایی**

**ایـــذایی** / 'îzāyî/: [عربـــی] صـــفت. ئـــازاردەر؛ گەهرێنەر؛ ئازارگەیێن: **ایذایی**

**ایــــر** / 'îr/:/اسم. لـــیر؛ لـــیرک؛ زیپکـــەی پانکەلەی سەر پێست.

**ایــراد** / 'îrād/: [عربـی]/اسم. ۱. /ـــهـــا؛ ـــات/ خەوش؛ ئیراد؛ ئاخ؛ عەیب؛ ئێـوز؛ ئـەوز؛ ئـەرتـۆ؛ ئووبا؛ ئوون؛ ئتەو ‹کـارش ایـراد نداشـت: کـارەکـەی خـەوشـی نـەبـوو› ۲. [ادبـی] کـــار یـــان ڕەوتیگـوتن؛ وتـن؛ پـەیـڤین؛ ئاخـافتن؛ دەربـڕین؛ واتـەی ۳. کـار یـان ڕەوتی لێـوەدان؛ لێدان ‹ایراد اتهام: لێوەدانـی تاوان›.

▣ **ایراد اتهام:** لێوەدانی تاوان.

**ایـراد بنـیاسـرائیلی:** [کنـایی] بـەهـانـەی بـەنیئیـسرائیلی؛ بـڕ و بیـانووی بـنشـڕ و بێپایە.

**ایـراد جـرح:** کـاری زامـارکردن؛ بریـنـدار کردن.

**ایراد خطابه:** قسەکردن؛ وتاردان.

**ایراد ضرب:** لێدان.

▣ **ایـراد داشـتن:** خـەوشـدار بـوون؛ عـەیبـدار بوون.

**ایرادکـردن:** ۱. گـوتن؛ وتـن؛ پـەیـوین؛ پـەیـڤین؛ واتـەی؛ ئاخـافتن ۲. دەربـڕین؛ بەیانکردن.

**ایراد گـرفتن:** ڕەخنـەگـرتن؛ عـەیـب گـرتن؛ لەقەمگرتن؛ تانە دینەوە؛ ئیرادگرتن.

**ایـرادی نبـودن:** قـەیـدێ نـەکـردن؛ قـەی نـەکـردن ‹ایـرادی نیـست، مـیتوانیـد برویـد: قـەیـدی ناکـا، دەتـوانن بـڕۆن›. هـەروەهـا: **ایرادی نداشتن**

**ایرادگیـر** / 'îrādgîr، ـــهـا؛ ـــان/: [عربی/ فارسی] صفت. وردەگـیر؛ ڕەخنـەگـر؛ ئیرادگـر؛ لێگـر؛ عـــەیـــب دۆزەرەوە؛ ئـــەرتـــەوگـــر؛ ئـــوونگر؛ دژپەسەن.

**ایــرانشـــناس** / 'îrānšenās، ــــهـا؛ ـــان/:/اسم. ئێـرانـنـاس؛ کـەسـێک کـە خـاوەن زانیـاری پێویست سـەبـارەت بـە ئێرانـە (زۆرتـر لـە بـاری مێژووییەوە).

**ایـــــرانشناســـــــی** / 'îrānšenāsî/:/اســـم. ئێراننـاسـی؛ لێکۆڵـینەوە سـەبـارەت بـە مێـژوو، زوان و فەرهەنگی ئێران.

**ایرانــی**[1] / 'îrānî/:/اسم. ئێـرانی: ۱. /ـــهـا؛ ـــان/

هەرکام لە خەڵکی ئێران ۲. لقێک لە زمانەکانی هیندو ئێرانی (بریتی لە ئەویستایی، فارسی کەون، پالەوی، فارسی ناوەڕاست، فارسی دەری، فارسی ئەمڕۆیی، تاجیکی، فارسی ئەفغانی، کوردی، بەلووچی، گیلەکی، مازەندەرانی، تالشی، تاتی، خوتەنی، سوغدی، ئاسی، خوارەزمی، پەشتوو و زۆریکی‌تر).

**ایرانی**[2]: *صفت.* ئێرانی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە وڵاتی ئێران ‹گوزن ایرانی: کەڵەکێوی ئێرانی› ۲. بەرهەم و دەسکردی ئێران ‹قالی ایرانی: قالی ئێرانی›.

**ایرانیت** / 'îrānît/: *اسم.* ئیرانیت؛ جۆرێ وەرەقەی سیمانی یان پەلاستیکی بۆ سەر میچ یان دیوارۆکە.

**ایرانیک** / 'îrānîk/ حروف‌ایرانیک، **حروف**

**ایرباس** / 'eyrbās/، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* ئەیرباس؛ جۆرێ فڕۆکەی مسافربەری گەورە.

**ایرتاکسی** / 'eyrtāksî/، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* فڕۆکە تاکسی؛ فڕۆکەیەکی چکۆلە کە زۆرتر لە بەرامبەر وەرگرتنی کرێ، مسافر دەربەست ئەگەینێتە جێگایەک.

**ایرکاندیشن** / 'e(y)rkāndîšen/: [انگلیسی] /*اسم.* ئەیرکوندیشن؛ ئامراز و سیستەمی گەرم و ساردکردنی هەوا بە دڵخواز.

**ایرلندی** / 'îrlandî/: *اسم.* ئیرلەندی: ۱. لە زوانگەلی سێلتی، کە لە ئیرلەندا باوە ۲. /ـها؛ ـان/ هەر کام لە خەڵکانی ئیرلەند یان زارۆکانیان.

**ایریدیم** / 'îrîd(i)yom/: [فرانسوی]/*اسم.* ئیریدیۆم؛ توخمی کیمیاوی کانزا بە ژمارەی ئەتومی ۷۷ و کێشی ئەتومی ۱۹۲٫۲۲.

**ایز** / 'îz/: [ترکی]/*اسم.* [گفتاری] ۱. شۆپ؛ شۆپێ؛ شوێن‌پێ؛ جێ‌پێ؛ یاگەپا ۲. ڕێگای پاشێل‌کراو.

▣ **ایزگم کردن:** ۱. جێگە پێ نەهێشتنەوە؛ جێ پێ پێوارکردن ۲. *[کنایی]* بەرگری کردن لە ئاگادار بوونەوەی کەسێک لە مەبەستێک (زیاتر پاک‌کردنەوەی شوێنی تاوان).

**ایز بە گربە گم کردن:** *[کنایی]* تێکۆشانی بێهوودە بۆ شاردنەوەی کارێک.

**ایزا** / 'îzā/: *اسم.* لێوارە ی شەمچە کە ئاڵشتە بە ماکێکی زبرە و چێو شەمچەی پێدا دەکێشن تا داگیرسێ.

**ایزد** / 'îzad/: *اسم.* *[ادبی]* ئیزەد: ۱. خوا؛ خودا؛ خودێ ۲. /ـان/ فریشتە؛ لە فەرهەنگی کۆنی ئێرانیدا، هەرکام لەو فریشتانە بە پلە یەکی نزمتر لە ئیمشاسپەندان ‹ایزد آتش: ئیزەدی ئاگر›.

**ایزدی** / 'îzadî/: *صفت.* ۱. خودایی؛ خوایی ۲. یەزدی؛ ئێزدی؛ یەزیدی؛ پەیڕەوانی ڕەوشتی ئێزەدی؛ کۆمەڵی مەلەک تاوس پەرەست.

**ایزوبار** / 'îzobār/: [فرانسوی]/*اسم.* *[شیمی]* هاوگوشار؛ دوو شوێنی جیاواز لە سەر زەوی بە گوشاری یەکسانەوە.

**ایزوترم** / 'îzoterm/: [فرانسوی]/*اسم.* هاودەما؛ ئەو شوێنانەی زەوی کە گەرما و سەرمایان وەک یەکە.

**ایزوتروپ** / 'îzot(e)rop/: [فرانسوی] *صفت.* هاولف؛ دوو یان چەند شتی لە هەموو بارێکەوە وەک‌یەک.

**ایزوتوپ** / 'îzotop/، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* *[شیمی]* ئیزۆتۆپ؛ دوو یان چەند ئەتوم لە یەک توخم کە ژمارەی نوترۆن و دوابەدوا کێشی ئەتومییان پێکەوە جیاوازە (وەک کولۆری۳۵ و کولۆری۳۷ یان کەربونی ۱۲ و کەربونی ۱٤).

**ایزوتونیک** / îzotonîk/: [فرانسوی] *صفت. [شیمی]* هاوگوشار: **ایزوبار**

**ایست** / îst/: *اسم.* ۱. کار یان ڕەوتی ڕاوەستان؛ وەستان؛ وێسان؛ ویسیان؛ وسیاین؛ مدرەی ۲. *[پزشکی]* وێستانەوە؛ وێستان؛ لەکار کەوتنی ئەندامێکی لەش ‹ایست قلبی: ویستانەوەی دڵ›.

▣ **ایست دادن:** چقدان؛ فەرمان‌دان بە وەستان.

**ایستا** / îstā/: *صفت.* بێ‌جوولە؛ بێ‌جمان؛ وێستاو؛ ڕاوەستاو؛ مدرا؛ مردا.

**ایستائی** / îstā'î/ ☜ **ایستایی**

**ایستادگی** / îstādegî/، ـها/: *اسم.* بەردەوامی؛ پتەوی؛ خۆڕاگری؛ ڕاوەستاوی؛ باشاری؛ پاوەجێیی. هەروەها: **ایستادگی کردن**

**ایستادن** / îstādan/: *مصدر. لازم. //ایستادی:* ڕاوەستای؛ **میایستی:** ڕادەوەستی؛ **بایست:** ڕاوەستە// ڕاوەستان؛ وەستان؛ وێسان؛ ڤەڤەستان؛ ڤەستان؛ وسیاین؛ وسان؛ هوساین؛ مدرەی؛ مدرای؛ مردەی: ۱. بە پێوەبوون؛ لە سەر پاوە بوون ‹راست ایستادن: ڕاست ڕاوەستان› ۲. لەکار و جوولەکەوتن ‹ایستادن ماشین: وەستانی ماشین› ۳. وەستانەوە؛ باشاری یان پێکۆڵی کردن ‹در برابر دشمن ایستادن: وەستان لە بەرامبەر دوژمنەوە› ٤. سەبرکردن؛ ماتڵ بوون ‹منتظر ایستادن: چاوەڕێ وەستان›. هەروەها: **ایستادنی**

■ صفت مفعولی: **ایستاده** (ڕاوەستاو) / مصدر منفی: **نَایستادن** (ڕانەوەستان)

**ایستادنکی** / îstādanakî/: *قید. [گفتاری]* بەپێوە؛ بەپاوە؛ وەپاوەو؛ پەیوە؛ پایوە؛ بە دۆخی وێستاو؛ لەسەر پێیان ‹نهارم را ایستادنکی خوردم: فراوینەکەم بەپێوە خوارد›.

**ایستاده**[1] / îstāde/: *صفت.* ۱. بێ‌جوولە؛ ڕاوەستاو؛ ڕاگیراو؛ ڤەڤەستای؛ مەن؛ مەنگ ‹آب ایستاده: ئاوی ڕاوەستاو› ۲. لەسەرپێ؛ ڕاست؛ مدرا؛ وسیاگ؛ وێسیاگ. بەرانبەر: **خوابیده**

**ایستاده**[2]: *قید.* ڕاوەستاو؛ بەپێوە؛ لە سەر پا؛ لە سەر پێ؛ پاوە؛ پەیوە؛ پایوە ‹چرا ایستاده غذا می‌خوری؟: بۆچی بەپێوە نان دەخۆی؟›.

**ایستار** / îstār/: *اسم.* شێواز؛ پێودان؛ ڕێ و ڕەوشتی تایبەتی کەسێک بەرانبەر بە برێ شتگەلی ژیانی کۆمەلایەتی وەک: بنەماڵە، سیاسەت، زانست و...

**ایستانبرق** / îstānbarq/: [فارسی/ عربی] *اسم.* کارەبای وێستاو.

**ایستاندن** / îstāndan/: *مصدر. متعدی. [نامتداول] //ایستاندی:* ڕاتوەستاند؛ **میایستانی:** ڕادەوەستێنی؛ **بایستان:** ڕاوەستێنە// ڕاوەستاندن؛ وەستاندن؛ وێساندن؛ ڤەستاندن؛ ڤەڤەستاندن؛ وسانن؛ قەفالتن؛ مدرنەی؛ مدرنای: ۱. شتێ یان کەسێک لە جوولە خستن ۲. ڕاستکردنەوە؛ خستنە سەرپێ ❋ **ایستانیدن**

■ مصدر منفی: **نَایستاندن** (ڕانەوەستاندن)

**ایستانیدن** / îstānîdan/ ☜ **ایستاندن**

**ایستایی** / îstāyî/: *اسم.* وەستاوی؛ وێسیاگی.

**ایستگاه** / îstgāh/، ـها/: *اسم.* وێستگە؛ وەستانگە؛ ئێزگە: ۱. جێگای وێستانی ئامێری هاتوچوو بۆ سوارکردن و دابەزاندنی مسافر ‹ایستگاه قطار: وێستگەی شەمەندەفەر› ۲. بنکەی تایبەتی ڕاگوێزانی برێک لە کارگەل ‹ایستگاه برق: ئیزگەی کارەبا› ۳. جێگای وەستانی بەرپرسانێک کە ئەرکێکی تایبەتیان بە ئەستۆیە ‹ایستگاه بازرسی: وەستانگەی پشکنین›.

**ایشان** / îšān/: *ضمیر.* ۱. ئەوان؛ ئەوانە؛ وان؛

ئادیّ؛ ئادیشا؛ ئانیّ؛ جێناوی ئامـاژه بـۆ سێهەم کەسی کۆ ۲. ئەو؛ وی(بۆ نێر)؛ویّ (بۆ مێ)؛ ئاد (بۆ نێر)؛ ئاده (بۆ مێ)؛ جێناوی ئاماژه وێڕای ڕێزلێنان بۆ سێهەم کەسی تاک.

**ایضا** / 'ayzan/: [عربی]قید. دیسان؛ دیسا؛ دیسانەوه؛ هەروەسا؛ هەرپاسە؛ هەیدی؛ دوباره؛ هەیدیک؛ ئەمجاریش؛ واوی؛ سەرلە نوێ ‹ایضا داستانی نقل می‌کنند: دیسان چیرۆکێک دەگێڕنەوە›.

**ایضاح** / 'îzāh/: ـات/: [عربی]اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی ڕوون‌کردنەوه؛ شی‌کردنەوە.

**ایغور** / 'oyqûr/: [ترکی]اسم. ئۆیغوور: ۱. خێڵێک لە ڕەگەزی تورک، دانیشتووی ئاسیای ناوەڕاست و باکووری ڕۆژئاوای چین ۲. /ـها/ هەرکام لە خەڵکی ئەو هۆزه * **اویغور**

**ایغوری** / 'oyqûrî/: [ترکی]اسم. ئۆیغووری: ۱. زوانی خەڵکی ئۆیغوور، لە زاراوەکانی تورکی ڕۆژهەلات ۲. شێوەی نووسینی ئەو هۆزه * **اویغوری**

**ایفا** / 'îfā/: [عربی]اسم. جێبەجێیی؛ کار یان ڕەوتی ئەنجامدان؛ مەشاندن؛ کودانـدن ‹نمایندگان وظیفه ی خود را به خوبی ایفا می کنند: نوێنەران ئەرکی خۆیان بە باشی جێبەجێ دەکەن›.

**ایفاد** / 'îfād/: [عربی]اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی ناردن؛ هەناردن؛ کیاسەی؛ ڕەوانە کردن (بەتایبەت) نامه و...

**ایقاع** / 'îqā'/: [عربی]اسم. [موسیقی، قدیمی] کێش؛ ڕیتم.

**ایقان** / 'îqān/: [عربی]اسم. [ادبی] ڕەوتی بڕوا کردن؛ دڵدامەزران؛ دڵقایم بوون.

**ایکس** / 'îks/: [فرانسوی]اسم. ئیکس: ۱. ناوی بیست و چوارەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فەرانسی و ئینگلیزی (X,x) ۲. /ـها/[مجازی] نەناس؛ نادیار؛ نەناسراو ‹آقای ایکس: کابرای نەناس›.

**ایگرگ** / 'îgreg/: [فرانسوی]اسم. ئیگرێگ: ۱. ناوی بیست و پێنجەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فەرانسی و ئینگلیزی (Y,y) ۲. /ـها/[مجازی] نادیارێکی‌تر؛ نەناسێکی‌تر.

**ایگلو** / 'îglû/، ـها/: [؟]اسم. ئیگلوو؛ کاڵیتی بەفری؛ ماڵۆکەی ئێسکیمۆیان کە بە سەهۆڵ و بەفر دروستی دەکەن.

**ایل** / 'îl/، ـها؛ ـات/: [ترکی]اسم. ۱. هۆز؛ هۆزان؛ عاشیرەت؛ ئیل؛ ئێل؛ خێڵ؛ عێل ‹ایل قشقایی: هوزی قەشقایی› ۲. تیره؛ ڕەوەز؛ ڕەوەند؛ کۆمەڵە کۆچەرێک پێکەوه ‹ایل و تبار: تیره و تایفه› ۳. [مجازی] خێڵ؛ هووڕەو؛ کۆمەڵ و ئاپۆرەی خەڵک ‹یک ایل ریختند توی خانه: خێلیّ کردیانه ماڵەوه›.

▣ **ایل ایلاق و قشلاق رو**: ڕەوەن؛ خێڵەکی؛ ئەوانەی گەرمێن و کوێستان دەکەن.

**ایلامی**[1] / 'îlāmî/: اسم. ئیلامی: ۱. /ـها؛ ـان/ عیلامی؛ هەرکام لە خەڵکانی وڵاتی مێژوویی ئیلام لە باشووری ڕۆژئاوای ئێران ۲. عیلامی؛ زمان یان شێوه نووسینی ئەو هۆزه: **عیلامی** ۳. /ـها/ هەر کام لە خەڵک و دانیشتوانی شاری ئیلام له ڕۆژاوای ئێران.

**ایلامی**[2]: صفت. ئیلامی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە وڵاتی ئیلام: **عیلامی** ۲. پێوەندیدار یان سەر بە شاری ئیلام.

**ایلئوم** / 'île'om/: [انگلیسی]اسم. ڕێخۆڵەباریکە؛ لوولەیەکی درێژ و باریکە لە ناوزگدا کە سەرێکی دەلکێتە گەدەوه و ئەو سەری ئەچێتەوه سەر ڕێخۆڵەگەوره، زۆربەی خۆراک و ئاوی پێویست بۆ لەش لەوێوه جەزب دەبێ.

**ایلئون** / 'île'on/: [انگلیسی] ☜ **ایلِئوم**

**ایل‌بیگی** / îlbeygî'، ـها/: [ترکی]/اسم. [قدیمی] ئیلبەگی؛ سەرۆکی خێڵ؛ ئێڵ بەگ؛ لە گەورەکانی هۆز کە زۆرتر کوڕ یا برای سەرداری عێڵە.

**ایلجار** / îlcār'/: [ترکی]/اسم. [گفتاری] گەل؛ عێلجاری؛ زبارە؛ هەرەوەز؛ کار یان ڕەوتی کۆبوونەوەی ئاپۆرە بۆ جێبەجێ کردنی کارێک بە کۆمەڵ.

**ایلچی** / îlčî'، ـها؛ ـان/: [ترکی]/اسم. [قدیمی] باڵوێز؛ نوێنەر؛ نێردراو ‹ایلچی دولت انگلیس: باڵوێزی دەوڵەتی ئینگلیز›.

**ایلچیگری** / îlčîgarî'/: [ترکی/ فارسی]/اسم. [قدیمی] باڵوێزی؛ کار یان ئەرکی نوێنەری.

**ایلخان** / îlxān'، ـها؛ ـان/: [ترکی]/اسم. [قدیمی] سەرخێڵ؛ سالاری هۆزی کۆچەر؛ گەورەی هۆز؛ سەرەک هۆز؛ سەرعێڵ.

**ایلخی** / îlxî'، ـها/: [ترکی]/اسم. ۱. ڕەوە؛ ڕانە ئەسپ؛ گەلە ئەسپ ۲. [کنایی] هووڕەو؛ دەستەیەکی زۆر لە خەڵک؛ ئاپۆرەی حەشامات.

**ایلغار** / îlqār'، ـها/: [مغولی]/اسم. [قدیمی] قەڵتوبڕ؛ عێلغار؛ هورووژم؛ دابەڕزانی سپایانی دوژمن وێڕای کوشت و بڕ و تالان و تاژان.

**ایل‌وتبار** / îl-o-tabār'، ـها/: [ترکی/ فارسی] اسم. هۆز؛ تیرە و تایەفە؛ هۆز و بەرە.

**ایلول** / îlûl'/: [سریانی]/اسم. ئەیلوول؛ ئیلوول: ۱. مانگی نۆهەمی ڕۆژمێری و لاتانی عەرەبی کە ۳۰ ڕۆژە و بەرامبەر بە مانگی سێپتامبرە ۲. مانگی دوازدەهەمی ساڵی عورفی و مانگی شەشەمی ساڵی ئایینی جوولەکە کە ۲۹ ڕۆژە و بەرامبەر بە مانگی سێپتامبر و ئووتە.

**ایلی** / îlî'/: [ترکی] صفت. خێڵی؛ هۆزی: ۱. خێڵەکی؛ هۆزەکی؛ پێوەندیدار یان سەر بە خێڵ ۲. خێڵانە؛ هۆزانە؛ وەکوو هۆز؛ بە کۆمەڵ ‹بە صورت ایلی کوچ کردند و رفتند: بە شێوەی خێلانە کۆچیان کرد و چوون›.

**ایلیاتی** / îl(i)yātî'/: [ترکی/ عربی] صفت. [گفتاری] خێڵی؛ عەشیرەتی.

**ایلینیم** / îlîn(i)yom'/ ☜ **رُومتیُم**

**ایما** / îmā'، ـها/: [عربی]/اسم. هێما؛ ئاماژە؛ ئاشیرەت؛ ئیشارە بە چاو یان برۆ و...

**ایماژیست** / îmājîst'/: [فرانسوی] ☜ **تصویرگرا**

**ایماق** / oymāq'/: [ترکی] ☜ **اویماق**

**ایمان** / îmān'/: [عربی]/اسم. ۱. ئیمان؛ بڕوا؛ باوەڕ؛ باوڕ؛ ڕەوتی باوەڕ پێ کردن ‹ایمان به مردم: باوەڕ بە خەڵک› ۲. بڕوایی بە پاڵپشتی گرۆی ئایینی یا مەرامیەوە ‹ایمان بە خدا: بڕوا بە خودا› ۳. [ادبی] دینداری؛ موسڵمانەتی؛ بەرامبەری کوفر.

▣ **ایمان آوردن**: ئیمان هێنان؛ بڕوایی هێنان؛ ڕاستی و دروستی شتێک بڕوا پێ کردن و پێهاتنی.

**ایمان داشتن**: بڕوا بوون؛ باوەڕدار بوون: ۱. بڕوا هە بوون بە ڕاستی و دروستی کارێک یان بنەمایەک ‹او بە راهش ایمان داشت: بە ڕێبازەکەی بڕوای هەبوو› ۲. پەیڕەوی ئایین و بنەمایێ بوون ‹بە خدا ایمان دارد: باوەڕی بە خودا هەیە›.

**ایمانی** / îmānî'/: [عربی] صفت. ئیمانی؛ بڕوایی؛ باوەڕی؛ پێوەندیدار یان سەر بە باوەڕ ‹رابطەی ایمانی: پەیوەندی ئیمانی›.

**ایمپالا** / împālā'، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ئیمپالا؛ ئاسکی گەورەی ئەفریقایی کە نێرەکەی شاخێکی درێژی هەیە.

**ایمن** / îmen, 'îman'/: [عربی] صفت. [ادبی] هێمن؛ خاوەنی هێمنایەتی؛ بێ‌وەی.

هەروەها: **ایمن بودن؛ ایمن شدن**

**ایمنی** / îmenî, 'îmanî'/: [عربی]/اسم.

هێمنی: ۱. دووری لە زیان و شەڕوشۆڕ ۲. پارێزراوی لە بەرانبەر نەخۆشیگەلەوە ۳. بێمەترسیەتی.

**ایمنی‌شناسی** / îmenîšenāsî, îmanî- /: [عربی/ فارسی]/اسم. پارێزناسی؛ لێکۆڵینەوەی زانستیانەی هۆکاری نەخۆشینگەل و شێوەی پارێز لێ‌کردنیان.

**ایمه** / ayemme /: [عربی] جمعِ ☜ **امام**

**ایمیل** / îmeyl /: [انگلیسی] ☜ پست الکترونیکی، **پست**

**این** [1] / în /: صفت. ئەم؛ ئەیە؛ یە؛ ئی؛ ئەی؛ ئەڤ؛ ئەڤە؛ ئەوهە؛ ڤینا؛ نەی؛ نێ؛ نی‌یی؛ نیا؛ یە؛ ئاماژەپێکراو یان لە بارەیەوە قسەکراو ‹این کتاب را بردارید؛ این کار درست نیست: ئەم کتێبە هەڵگرن؛ ئەم کارە دروست نیە›.

◘ **این بنده**: ئەمن؛ من؛ ئەم بەندە؛ ئەم بچووکە: **این حقیر؛ این دعاگو؛ این غلام**

**این جانب** ☜ **اینجانب**

**این جهان**: ئەم دنیایە؛ ئەم جیهانە؛ جیهانی زیندوان. بەرانبەر: **آن‌جهان**.

هەروەها: **این‌جهانی**

**این حقیر** ☜ **این‌بنده**

**این دعاگو** ☜ **این بنده**

**این غلام** ☜ **این بنده**

◘ **این پا آن پا کردن**: *[مجازی]* سنەسن کردن؛ پاوپا کردن؛ خنەخنن کردن؛ خاوەخاو کردن بۆ ڕۆیین ‹چرا اینقدر این پا و آن پا می‌کنی؟ الآن قطار راه می‌افتد: بۆچی ئەمەندە سنەسن دەکەی؟ ئێستا قەتارەکە دەڕوا›.

**این دست آن دست کردن**: *[مجازی]* مسەمس کردن؛ دەس‌ـدەس کردن؛ دەساودەس کردن؛ پەلە نەکردن لە جێبەجێ کردنی کارێکدا ‹اگر قصد خریدش را داری، دیگر این دست آن دست نکن: ئەگەر دەتەوێ بیکڕی، ئیتر مسەمس مەکە›.

**این** [2] / ـها؛ ـان /: ضمیر. ئەمە؛ ئەوە؛ ئەڤە؛ ئەیە؛ ئینە؛ یە: ۱. ئائەمە؛ ئائمە؛ ئاماژە بۆ نزیک ‹این کتاب است؛ این یا آن، کدام را می‌خواهید؟: ئەمە کتێبە؛ ئەمە یان ئەوە، کامیانت دەوێ؟› ۲. جێناوی ئاماژە بۆ جگە لە مرۆڤ ‹این را بردار: ئەمە هەڵگرە› ۳. *[گفتاری]* ئەم؛ ئێد(بۆ نێر)؛ ئێدە(بۆ مێ)؛ جێناوی ئاماژە بۆ سێهەم کەسی تاک ‹این حرف حساب سرش نمی‌شود: ئەمە خۆ قسەی حیسابی بە گوێیدا ناچێ› ٤. *[مخفف]* ئەم‌دانە؛ ئەم‌تاکە ‹این را هم بردار: ئەمەش هەڵگرە›.

**اینترنت** / înternet /: [انگلیسی]/اسم. ئینترنیت؛ تۆڕی کامپیوتەری نێونەتەوەیی بۆ پێوەندی و زانیاری‌گرتن.

**اینجا** [1] / încā /: قید. ئێرە؛ ئێرا؛ ئەیرا؛ ئێرانە؛ ئەمیا؛ هێری؛ ئەگرە؛ ئەیرە؛ هێر؛ وەیتا؛ هرە؛ ئیرە؛ ڤر؛ ڤرا؛ چێ؛ ئێگە؛ ئەمێ؛ ناڤەر؛ جێگای ئاماژەپێکراو ‹اینجا سنندج است: ئێرە سنەیە›.

**اینجا** [2]: ضمیر. ئێرا؛ ئەیرا؛ ئەورە: ۱. /ـها/ لێرەکانێ؛ لێرەکانە؛ چیە؛ چیگە؛ لەم شوێنە ‹اینجا چیزی پیدا نمی‌شود: لە ئێرەدا شتێ پەیدا نابێ› ۲. ئێرە؛ ویە؛ ئەوێگە ‹بیا اینجا: وەرە ئێرە›.

**اینجانب** / încāneb /، ـان/: [فارسی/ عربی] ضمیر. من؛ ئەمن؛ ئەز (لە قسەکردن یا نووسراوەی ڕەسمیدا).

**اینچ** / înč /: [انگلیسی]/اسم. ئینچ؛ یەکەی پێوانەی درێژی لە وڵاتانی ئەنگلوساکسۆن هەمبەر بە ۲,٥٤ سانتی‌میتر.

◘ **اینچ مربع**: یەکەی ڕووبەر، بەرامبەر بە ٦,٤٥ سانتی‌میتری چوارگۆشە.

**اینچ مکعب**: یەکەی بارستایی، بەرامبەر بە ١٦,٣٩ سانتی‌میتری چوارپاڵوو.

**این‌چنین** / 'înčenîn/ ☜ **چنین**

**ایندکس** / 'îndex، ـــهـا/: [انگلیسی]/سم. پێڕست.

**ایندیم** / 'îndiyom/: [انگلیسی]/سم. ئیندیۆم؛ توخمی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٤٩ و کێشی ئەتومی ١١٤.

**اینشتنیم** / 'eyn(e)štînyom, 'ayn(e)štanyom/: [انگلیسی]/سم. ئێنشتێنیۆم؛ توخمێکی کیمیایی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤە بە ژمارەی ئەتومی ٩٩ و بە پێنج ئیزۆتوپەوە، لە ٢٤٨ تا ٢٥٢.

**این‌قدر** / 'înqadr/: [فارسی/ عربی] قید. هەیانا؛ ئەوەندە؛ ئەو ئەندازە؛ هەنۆ؛ ئەم ئەندازە؛ ئەمە؛ هۆندە؛ هێند؛ ئەوەندە؛ هێن؛ هەڤقاس؛ ئەو قاس؛ هەن؛ هەندایین؛ ئەمەنگە؛ ئەمەندە؛ ئەونە؛ ئێقە؛ ئیننە؛ ئننە؛ ئێقەرە؛ ئەچنە؛ ئەخکە ‹این‌قدر خوردم کە دلم درد گرفت: ئەوەندەم خوارد زگم هاتە ژان›.

**اینک** / 'înak/: قید. ئەوا؛ ئەمەسا: ١. فایە؛ ئەوەتا؛ ئەوەتانێ؛ وا؛ ئەوا؛ ئێستا؛ ئیسە؛ هەر ئێسە؛ ئەوێستا؛ ئێستاکە؛ ئێستەکانێ؛ هانی؛ لە کات یان دەمی کارێکدا ‹اینک باران می‌بارد: ئێستا باران دەبارێ› ٢. ئەوەها؛ ئانا؛ بۆ ئاماژە بە نزیک ‹بدو گفت اینک سر دشمنت: پێی گوت ئەوا سەری دوژمنەکەت›.

**اینکه**[1] / 'înke/: قید. ئەمەکە؛ ئەمەیکە؛ ئەمەیەکە ‹دیگر اینکه او را اصلا نمی‌شناسم: ئیترئەمەیکە ئەو هەر ناناسم›.

**اینکه**[2]: ضمیر. ئەمەکە؛ ئینەکە (بۆ نێر)؛ ئینێ‌کە (بۆ مێ)؛ ئەم کەسە یان ئەم شتە ‹اینکه می‌آید، غریبە است: ئەمەکە دێ، غەوارەیە›.

**این و آن** / 'în-o-ān/: ضمیر. ئەم و ئەو؛ ئەمە و ئەوە؛ ئێد و ئاد؛ ئینە و ئانە؛ ئاماژە بە شتان یان مرۆڤگەلی نەناسراو ‹همەی پولت را دادی بە این و آن: گشت پارەکەت دا بە ئەم و ئەو›.

**این‌ور و آن‌ور** / 'învar-o-ānvar/: ضمیر. شەقاشەق؛ ئێرە و ئەوێ؛ ئەملا و لا؛ ئەملا و ئەولا؛ ئیلا وێلا.

**اینها** / 'înhā/: ضمیر. ١. جمعِ ☜ **این**[2] ٢. ئەوان؛ یان؛ یانە؛ ئەیانە؛ ئادێ؛ ئادیشا ‹دیشب آزاد و اینها آمدند: دوێنێ‌شەو ئازاد و ئەوان هاتن›.

**اینهمانی** / 'înhamānî/: اسم. ١. پێناسە؛ ٢. /ـها/ وەک‌خۆیی؛ هاوسانی؛ هاوێنەیی؛ چۆناوچۆنی وێکچوون ٣. /ـها/ [ریاضی] یەکێتی.

**ایوان** / 'eyvān، ـها/: اسم. ١. هەیوان؛ هێوان؛ بەرهێوان؛ هەیبان؛ هەویان؛ ئەیوان؛ هەیوانە؛ بەرێوان؛ بەربێلایی؛ بەرمەیتاوی؛ ئەرمە؛ وەرتارمە؛ بەرمەی تاون؛ بەرسڤک؛ هەیوۆ؛ شوێنی باران نەگر؛ بە سەر بانی بێ‌دیواری ئەو لاو ئەو لا ٢. [قدیمی] کۆشک.

**ایوانک** / 'eyvānak، ـها/: اسم. بانجێلە؛ بەرهەیوان؛ هەیوانەکلێ؛ بانیژە.

**ایوانگاه** / 'eyvāngāh/: اسم. بانجێلە؛ بانیجە؛ بانیژە؛ بەرهەیوان؛ هەیوانسا.

**ایهام** / 'îhām، ـات/: [عربی] اسم. [بدیع] ئیهام؛ وشەیەک کە واتایێکی نزیک بە مێشک و واتایێکی دوور لە مێشکی هەیە و مەبەستی بێژەر واتا دوورەکەیە (وەک: وتم ئایا بە زاری خۆت ئەپرسی حالی زاری من؟/ بڕۆی هێنایەیەک وەک شکلی لا یەعنێ کە بێزارم).

**ایی** / 'ayî/: صفت. [کودکانە] قخە؛ چەپەڵ؛ خراپ؛ ئیش؛ عیش؛ کخ؛ پیس و پۆخڵ لە زاراوەی منداڵاندا.

# ب

**ب**[1] / b/: *حرف*. ب؛ پیتی دووهەمی ئەلف و بێتکەی زمانی فارسی.

**بـ**[2]: *پیشوند*. ١. نیشانەی ئاوەڵکار، بە واتای: بە شێوەی؛ بەـ ؛ لەگەڵ؛ لەتەک؛ چنی؛ چەنی ‹بزودی: بەزوویی› ٢. بـ ؛ نیشانەی فەرمان ‹برو؛ بگو: برۆ؛ بێژە› ٣. بـ ؛ نیشانەی ڕانەبردووی مەرجی سادە (مضارع التزامی) ‹بروم؛ بگویند: بڕۆم؛ بێژن› ٤. *[ادبی]* بەـ ؛ بـ ؛ دەچێتە سەر ناو، ئاوەڵناو یان ئاوەڵکار پێکدێنێ ‹بهوش: بەهۆش› ٥. *[گفتاری]* بـ ؛ بکەردی کارێک یان خاوەنی چۆنیەتیەک ‹تو بخر این خانە نیستی: تۆ بیت و ئەم مالە بسێن نیت›.

**ـبـ ـ**[3]: *میانوند*. ـبەـ ؛ ـوەـ: ١. نیشانەی دووپاتی و بەرامبەری ‹روبرو؛ یکبیک؛ سربسر: ڕووبەڕوو؛ یەکبەیەک؛ سەرەوسەر› ٢. لەیەکێک تا ئەوی تر ‹روز بروز؛ سال بسال: ڕۆژبەڕۆژ؛ ساڵوەساڵ› ※ **ـ بـ ؛ ـ بەـ**

**با**[1] / bā/: *اسم*. با؛ بێ؛ ناوی دووهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

▣ **بای بسم‌الله**: *[کنایی]* سەرەتا؛ سەرەتای شتێ؛ دەسپێکردنی شتێک؛ بێی بیسمیللا ‹از همان بای بسم‌الله بدوبیراه می‌گفت: هەر لە سەرەتاوە جنێوی دەدا›.

**بای تأکید**: *[ادبی]* لە سەرەتای کەردی زەمانی ڕابوردوودا، بۆ جوانی یا پاداگرتن دێ (برفت؛ بدیدی: ڕۆیی؛ دیتت).

**با**[2]: *قید*. لەپا؛ پای؛ پاو؛ لە بالا؛ لە سەر شانی؛ بە ئەستۆی ‹پول ناهار با من: پارەی فراوین لەپای من›.

**با**[3]: *حرف*. ١. وەل؛ دەگەڵ؛ دگەل؛ ڕەگەڵ؛ لەیەل؛ لەیەر؛ لەتەک؛ لەل؛ بە؛ چنی؛ چەنی؛ پێڕا؛ وەگەرد؛ تەبا؛ تەک؛ تەڤ؛ ڕا؛ دەگەڵی ‹با بهار آمد: دەگەل بەهاردا هات› ٢. بە؛ بەهۆی ‹با پای پیادە آمدم: بە پێیان هاتم› ٣. بەرامبەر؛ لەگەڵ؛ دەگەڵ؛ لەتەک؛ لێل؛ چنی؛ چەنی ‹با مردم نمی‌شود جنگید: لەگەڵ خەڵکدا شەڕ ناکرێ› ٤. *[ادبی]* بە؛ چنی؛ چەنی ‹با من گفت: بە منی گوت›.

**با ـ**[4]: *پیشوند*. بەـ ؛ بـ ؛ خاوەن ‹بافرهنگ؛ باارزش: بەفەرهەنگ؛ بەنرخ›.

**ـ با**[5]: *پسوند*. *[ادبی]* ـ با؛ ـ وا؛ ـ ئەوا؛ ـ باوی؛ ئاش؛ خواردەمەنی ئاوەکی؛ چێشت ‹دوغبا؛ شوربا: دۆخوا؛ شۆروا/ شۆربا›.

**بااتیکت** / bā'etîket/: [فارسی/ فرانسوی] *صفت*. بەوەج؛ پابەندی داب و نەریت (لە

هەڵس‌وکەوتی کۆمەڵایەتیدا) ‹مرد بااتیکتی بود: پیاوێکی بەوەج بوو›.

**بااحساس** [1] / bā'ehsās/: [فارسی/ عربی] *صفت*. هەستیار؛ بەهەست؛ هەستەوەر؛ هشکی؛ خاوەن هەست ‹آدم بااحساسی است: مرۆڤێکی هەستیارە›.

**بااحساس** [2]: *قید*. بەهەستەوە؛ هەستیارانە ‹گوینده بااحساس صحبت می‌کرد: وێژەر بەهەستەوە قسەی دەکرد›.

**بااطلاع** / bā'ettelā'/: [فارسی/ عربی] *صفت*. هویل؛ ئارا؛ ئاگا؛ ئاگەدار؛ هاگادار؛ هاگەدار؛ هایدار؛ ئاشایار؛ خەبەردار.

**بائت** / bā'et/: [عربی] *اسم*. *[نامتداول]* شەومەنە؛ شەڤی؛ بەیاق؛ چێشت و نانێ کە شەو ماوەتەوە.

**بائر** / bā'er/: [عربی] ☜ **بایر**

**بائو** / bā'û، ـها/: *اسم*. *[نجّاری]* باهۆ؛ باڵشمە؛ باڵاشم؛ پەروازە؛ هەر یەک لە برگەگەلی ئەستوونی چوارچێوەی دەرگا و دەلاقە.

**بائیدن** / bā'îdan/ ☜ **بایستن**

**باب** [1] / bāb، ـها؛ ابواب/: [عربی] *اسم*. ۱. /ابواب/ بەن؛ پاژ؛ پار؛ بەش؛ بەند؛ بەست؛ بەشێک لە کتێب ‹باب پنجم گلستان: بەشی پێنجەمی گولستان› ۲. *[جغرافیا]* تەنگە؛ قوڕنووش ۳. بار؛ مەڕ؛ بابەت؛ سەبارەت ‹در باب جنگ بحث شد: سەبارەت بە شەڕ باس‌کرا› ٤. چاوە؛ چاوک؛ دەس؛ دەستە؛ دانە؛ دەزگا (بۆ ماڵ و ملک) ‹دو باب دکان؛ سە باب خانە: دوو چاوە دووکان؛ سێ دەزگا ماڵ› ٥. *[قدیمی]* درگا؛ دەرگە؛ دریا؛ دەرکە؛ بەرە؛ دەروازە.

**باب** [2]: *صفت*. باو؛ برەو ‹بلند کردن موها باب شده‌بود: قژ درێژکردنەوە باو ببوو›. هەروەها: **باب بودن؛ باب شدن؛ باب کردن**

**باب** / bābe/: [عربی] *حرف*. هەموار؛ سزاوار؛ پڕ بە پێست؛ باو؛ پڕبەپڕ؛ لەبار و شیاو بۆ کەسێ یان شتێ ‹باب آقاست: پڕبەپێستی ئاغایە›.

◘ **باب دندان**: باو دیان؛ باوی خواردن؛ شیاو بۆ خواردن.

**باب روز**: باوی ڕۆژ؛ مودی ڕۆژ.

**باب طبع**: باوی دڵ؛ خۆش و سازگار لەگەڵ سروشتی کەسێکدا.

**بابا** / bābā، ـها/: *اسم*. ۱. باب؛ باوک؛ بابە؛ تاتە ۲. باوا؛ بابا؛ بابەگەورە؛ باوەگەورە؛ باپیر ۳. کەس؛ برادەرێک؛ یۆ؛ پیاوێکی نەناسراو ‹بابایی این نامه را آورد و رفت: کەسێ ئەم نامەیەی هێنا و ڕۆیشت› ٤. کابرا؛ کاورا؛ فلان؛ فلانی؛ کەسێ کە گەرەکیان نەبێ ناوی بێنن ‹آن بابا هم همین را گفت: ئەو کابرایەش هەر ئەمەی گوت› ٥. خزمەتکاری پیاو (بەتایبەت لە قوتابخانەدا) ٦. بابە؛ باوە؛ برا؛ هەتیو؛ هەتی؛ بۆ بەرهەڵست بوون دەگوترێ ‹ای بابا! اینهم شد حرف؟: ئەی بابە! ئەوەش بوو بە قسە؟›.

**باباآدم** / bābā'ādam، ـها/: [فارسی/ معرب] *اسم*. هەوێدار؛ بناوەتۆم؛ بەناوەتۆم؛ گەلابناوەتۆم؛ حەچەگیرە؛ هەچەگیرە؛ حەشەگیرە؛ جلگرە؛ پووزپێچ؛ کزنیکسەرە؛ ڕوەکێ کە گەلاکانی پانە و گولەکانی خڕت و دڕکاویە و ڕیشە و گەلاکانی بۆ دەرمان دەشێ: **باردان**

**بابابزرگ** / bābābozorg، ـها/: *اسم*. *[گفتاری]* باوەگەورە؛ باوەگەورێ؛ باپیر؛ باوا؛ بابا.

**باباشمل** / bābāšamal/: *اسم*. *[کنایی]* ۱. تەژە؛ کەتە؛ حەڤەنتی؛ باقوڕە؛ بەلان؛ زڕتۆ؛ ئابۆنە؛ هرچی‌مەندش؛ زەلامی بێ‌مشوور ۲. سەرپەتی؛ مرۆی گوێ‌نەدەر بە پووڵ و پارە.

**باباغوری** / bābāqûrî/: *صفت*. *[گفتاری]* چاوبۆق؛ چاوپۆق؛ بۆقرێ؛ چاودەرپەڕیو؛ چەم بلّح: **باباقوری**

**باباقوری** / bābāqurî/ ☜ **باباغوری**

**بـــابالحــــوایج** / bābolhavāyec/: [عربـــی] /اســـم. دەرگانـــــەی ڕەحمـــــەت؛ دەرگـــــای دابینکەری هەموو جۆرە ئاتاجێک.

**بــابالمعـــده** / bābolme'de/: [عربـــی] /اســـم. بەرگەدە؛ جێی لکانی گەدە بە ڕێخۆڵەوە.

**بابانوئل** / bābāno'el، ـها/: [فارسی/ فرانسوی] /اسم. *[مردم‌شناسی]* بابەنوێل: ١. پیرەپیاوێک بە بـەرگ و کلاو شاپۆی سوورەوە کە لە شەوی جێژنی لـە دایک بوونی مەسیح، بـۆ منـدالانی مـەسـێحی جێژنانە دەبا ٢. کەسـێ کـە خـۆی بـەم شـێوە دەرهێناوە.

**بابـت** / bābat، ـهـا/: [عربـی] /اسم. بـارە؛ بـاوەت؛ بابـەت ‹از ایـن بابـت حرفـی نـزد: لـەم بـارەوە قسەیێکی نەکرد›.

**بـابون** / bābûn، ـهـا/: [انگلیـسی] /اسـم. بـابوون؛ لـە مـەیموونگـەلی دونیـای کـۆن لـە ژێـر ڕاستەی مرۆتەشـکان کـە سـەری وەک سـەگ و کلکی کورت بووە.

**بابونـه** / bābûne، ـهـا/: /اسـم. گوڵـەچاوئێـشە؛ گوڵـەبابوونـە؛ گوراڵـەکـەچـەڵـێ؛ بـەیبـوون؛ بـابوون؛ بووینـە؛ بـابن؛ بابنـەپـێچ؛ باواینـە؛ گوڵەچەرمگە؛ گوڵەچەرمەڵـە؛ حـاجیبـەیـان؛ حاجیلــە؛ گوڵــەحاجیلــە؛ گوڵــەحاجیانــە؛ گوڵـەفـەقـێ؛ گیـا کلکـەوانـە؛ گـوڵتووتـک؛ گوراڵەچەرمـێ؛ گوراڵـەحاجیانە؛ گوڵـی سـپی یـان زەردی گیایـەکـی خۆڕسـکە کـە بـۆ دەرمان دەشێ.

⊡ **بابونـه گـاو چـشم**: کـارتیمۆک؛ کـارتمۆک؛ کـارتیمۆل؛ کـارتمۆڵ؛ قـەوان؛ بابوونـەی چاوەگـا؛ گیایـەکـە گوڵـێکی درشـتی زەرد دەکا.

**بـابی**[1] / bābî، ـهـا؛ ـان؛ بابیّـه/: [عربـی] /اسـم. *[قـدیمی]* بـابی؛ کـەسـێ کـە پـەیـڕەوی مـیرزا عـەلی محـەمـەدی شـیرازی (١١٨٨-١٢٢٧ هەتاوی) ناسراو بە باب بێ.

**بابی**[2]: *صفت.* بابیەتی؛ سـەر بـە بـاب یـان ڕێ و ڕەوشتی.

**بابیروسـا** / bābîrosā، ـهـا/: [؟] /اسم. بابیرۆسـا؛ جۆرێک بەرازی ئاسیای ڕۆژهەڵاتی کە شـفرەی یەکانەکەی لە ڕادەی ئاسایی درێژترە.

**بابیه** / bābîyye/: [عربی] جمعِ ☜ **بابی**[1]

**باتـدبیر** / bātadbîr، ـهـا؛ ـان/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت.* بـەڕاوێـژ؛ کـارزان؛ چـارەزان؛ چـازان؛ بەمشوور. هەروەها: **بی‌تدبیر**

**باتربیت** / bātarbîyat، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بەئەدەب؛ گونجاو؛ خاوەن هەڵسوکەوتی شـیاو. هەروەها: **بی‌تربیت**

**باتری** / bātrî، ـهـا/: [فرانسوی] /اسم. قـوە؛ پیـل: **باطری**

⊡ **باتری آفتابی**: پیلی هەتاوی.

**باتری تر**: پیلی تەڕ.

**باتری خشک**: پیلی وشک.

**باتریساز** / bātrîsāz، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. باتریساز: ١. کـەسـێ کـە کـاری گـۆڕین و چاکردنەوەی بـاتری و ئـامرازە کـارەباییـەکـانی ماشێنە ٢.کەسێ کە لە کارخانـە یـان کارگـای پیل‌سازیدا کاردەکا.

**باتریسازی** / bātrîsāzî/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. باتریـسازی: ١. کـاری بـاتری چـێ کـردن ٢. شـوێنی چاکردنــەوەی بـاتری و کـەلوپەلـە کارەباییەکانی ماشێن.

**بـاتلاق** / bātlāq/: [ترکـی] /اسـم. زەل؛ زەلکـاو؛ زن؛ زنـە؛ زەنـەک؛ زۆنـگ؛ زەنـج؛ زق؛ چـەلـوو؛ چەلاو؛ چراف؛ گـراف؛ گـەرەک؛ بـاتلاخ؛ بـلقاو؛ ئاوەزا؛ چـەق؛ هـەردی تـەڕی شـل کـە جـار و بارە گژوگیایشی لێدەڕوێ: **باطلاق**

**بـاتلاقی** / bātlāqî/: [ترکـی] *صفت.* زەلکـاوی؛ زەنـەکـی؛ چـەلاوی ‹زمینهـای بـاتلاقی: زەوینگەلی زەلکاوی›: **باطلاقی**

**باتولیت** / bātolît/: [؟]اسم. [زمین‌شناسی] پازار؛ جۆرێ بەردی بەدیهاتوو لە توێگەلی ژێرەوەی زەوی.

**باتوم** / bātûm/: [فرانسوی] ☜ **باتون**

**باتون** / bātûn/: [فرانسوی]اسم. شوشکە؛ لس؛ لیس؛ باتوم؛ میلەیێکی کورتی دارین یان پەلاستیکی کە پاسەبان و ئاژان، وەک چەکی سارد دەیبەستنە لای کەمەریانەوە: **باتوم**

▣ **باتون برقی**: شوشکەی کارەبایی.

**باتیس** / bātîs/: [از فرانسوی]اسم. جۆرە پارچەیەکی لە پەموو چنراوی پتەوە و دەوامی زۆری هەیە: **بادیس؛ باطیس**

**باتیک** / bātîk/: [انگلیسی از مالایی]اسم. باتیک؛ ڕەوشتێک لە ڕەنگ‌کردنی پارچە، بەم شێوە کە بەشێک لە قوماشەکە بە مۆم دادەپۆشن تا ڕەنگ نەیگرێ، ئەمجار دەڕەنگی دەگەوزێنن: **چاپ باتیک**

**باج** / bāc/: اسم. [قدیمی] باژ؛ باج: ۱. میجێتکی؛ تەوجی؛ باربۆ؛ پیتاک؛ خاوە؛ خویک؛ خەرج ۲. ڕادارانە؛ دەم چێشتانە؛ کەلەپوور؛ ئەو پارە میری لە خەلکی دەستێنێ ۳. [کنایی] بەرتیل؛ ئەو شتەی بۆ بەجێ‌هێنانی ڕەزامەندی زۆردار دەیدەن.

▣ **باج اربابی**: کەرانە؛ کەلە پیتاکی؛ باجی بە زۆر و ناهەقی؛ ئەوەی بە زۆرەملێ ئاغا یان زاوت لە ڕەنجبەری دەستێنن.

**باج سبیل**: [کنایی] ۱. تووورەکانە؛ بەرسمێلانە؛ باجێ کە گزیر لە رایەتی دەستێنێ ۲. پیتاک؛ شتێ یا دراوێ کە کەسێک بە نارەوایی (بە زۆر یان بە هەر شێوەیەکی‌تر) لە دیترانی دەستێنێ.

**باج مستغلات**: مالانە؛ باجی خانوان.

▣ **باج به شغال دادن**: [کنایی] سەر بۆ نامەرد دانەواندن؛ مل‌دان بە ناکەس؛ پیتاک‌دان بە ناپیاو.

**باج خواستن**: [کنایی] بەرتیل ویستن؛ پارەی نارەوا ویستن. هەروەها: **باج‌دادن؛ باج گرفتن**

**باج‌بگیر** / bācbegîr/، ـها؛ ـان/: اسم. باجگیر؛ پیتاک‌گر؛ باجسان؛ ملهوڕی بە زۆری پارە لە خەلک سێن.

**باج‌خواهی** / bācxāhî، ـها/: اسم. باج‌خوازی؛ باجسانی؛ کار یان ڕەوتی پارەی نارەوا ویستن.

**باجراه** / bācrāh، ـها/: اسم. ڕێگایێک کە بۆ پێداچوونی دەبێ پیتاک (باج) بدرێ.

**باجگاه** / bacgah/: اسم. ڕادارخانە؛ باجگە.

**باجگزار** / bācgozār، ـها؛ ـان/: اسم. [قدیمی] پیتاکدەر؛ ئەوەی‌کە باج دەدات.

**باجگیر** / bācgîr، ـها؛ ـان/: اسم. باجەوان؛ باژوان: ۱. ڕادار؛ پیتاک وەرگر؛ باجگر؛ باج ئەستێن؛ ئەوەی کە بۆ دەولەت باج کۆ دەکاتەوە ۲. باجگیر؛ پیتاک‌گر؛ باجسان؛ ملهوڕی بە زۆری پارە لە خەلک سێن.

**باجگیری** / bācgîrî، ـها/: اسم. باژەوانی؛ ڕاداری؛ باجگری؛ کار و ڕەوتی وەرگرتنی باج.

**باج‌میل** / bācmîl، ـها/: اسم. باج‌میل؛ میلەیەک لە سەر ڕێ کە دوای باج‌دان بەرز دەبێتەوە و ڕێگاکە دەکاتەوە.

**باجناق** / bācenāq, bācanāq، ـها/: [ترکی] اسم. ئاوەڵ‌زاوا؛ ئاوال‌زاوا؛ هاوزاوا؛ هامزاما؛ هامزەما؛ هەمزەما؛ هەڤال‌زاوا؛ هەڤزاڤا؛ هاوزەوا؛ هامڕیش؛ هومڕیش؛ هەڤلنگ؛ نێوانی دوو پیاو کە ژنەکانیان خوشکن.

**باجه** / bāce، ـها/: [ترکی ؟]اسم. هۆدە؛ ئۆدە؛ باجە؛ شوێنێکی چکۆلە بۆ فرۆشتنی شتێک یان جێبەجێ‌کردنی کارێک ‹باجەی تلفن: هودەی تەلەفوون›.

▣ **باجەی بلیت‌فروشی**: هۆدەی بلیت‌فرۆشی.

**باجەی پست:** هۆدەی پوست.

**باجەی تلفن:** هۆدەی تەلەفوون.

**باجی** / bācî، ـها/: [ترکی]/اسم. *[گفتاری]* باجی: ۱. خوشکێ (زۆرتر بۆ بە سووکی بانگ‌کردن) ‹باجی! چادرت را جمع کُن: باجی! چارشێوەکەت خڕکەوە› ۲. لەلە؛ دایەن؛ دایان ۳. کارەکەر؛ کارەکەرە؛ کلفەت.

**باحال**[۱] / bāhāl/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[گفتاری]* خۆش؛ وەبەردڵ ‹مهمانی باحالی بود: میوانییێکی خوش بوو›.

**باحال**[۲]: *قید.* *[گفتاری]* جوان؛ خۆش؛ وەش ‹داماد خیلی باحال می‌رقصید: زاوا زۆر جوان هەڵدەپەڕی›.

**باحالت** / bāhālat/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بەگیان؛ سەرزیندوو؛ زرک و زیننە.

**باحور** / bāhûr/: [معرب از سریانی]/*اسم.* هەڵم؛ هەڵمی؛ هەپ: ۱. بۆقێک کە لە کاتی گەرم بوونی هەوا (وەک خۆر کەوتنەوەی دوای باران) لە زەوی بەرز دەبێتەوە ۲. هالاو؛ گەرمەوەزە؛ گەرمەوزە؛ گەرمای تیژ.

**باخبر** / bāxabar/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ئاگادار؛ هاگادار؛ خەبەردار؛ ئاگا؛ خاوەن خەبەر.

**باخت** / bāxt/: *اسم.* ڕەوتی دۆڕان؛ خپان؛ دانیان؛ قزیان؛ خیچ: ۱. /ـها/ ئەوەی دۆڕاندوویانە ‹آرام در قمار صد تومان باخت، یعنی باخت او صد تومان بود: ئارام لە قوماردا سەد تمەنی دوراند، واتا دورانەکەی سەد تمەن بوو› ۲. کار یان ڕەوتی دۆڕاندن ‹بازی هم برد دارد هم باخت: یاری هەم بردنەوەی هەیە و هەم دوران› ۳. *[مجازی]* شکست؛ کار و ڕەوتی بۆڕ خواردن ‹باخت او در این بازی حتمی است: دورانی لەم کایەدا مسۆگرە›.

**باختر** / bāxtar/: *اسم.* *[ادبی]* خۆراوا؛ ڕۆژئاوا؛ ڕۆژئاڤا؛ خۆرنشین؛ ڕۆژنشین.

**باختران** / bāxtarān/: *اسم.* ڕۆژاوا؛ وڵاتی لای ڕۆژئاواوە.

**باخترزمین** / bāxtarzamîn/: *اسم.* باختەر؛ وەڵاتی ڕۆژاوا.

**باختری** / bāxtarî/: *صفت.* *[ادبی]* ڕۆژاوایی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە ڕۆژاوا ‹نژاد باختری: ڕەگەزی ڕوژاوایی› ۲. لە ڕۆژاوا ‹کرانەی باختری رود اُردن: زێواری ڕوژاوایی چۆمی ئوردون›.

**باختن** / bāxtan/: *مصدر متعدی.* // **باختی:** دۆڕاندت؛ **می‌بازی:** دەدۆڕێنی؛ **بباز:** بدۆڕێنە// ۱. دۆڕاندن؛ دانان؛ دانیان؛ دانین؛ دۆڕان؛ دۆڕیان؛ دۆڕنەی؛ ئەرەنیەی؛ چویزان؛ کچانن؛ ژێرکەفتن؛ خیچان؛ وەزین؛ خپاندن؛ بازین ۲. *[ادبی]* گەمەکردن؛ قومار کردن ‹نرد باختن: نەرد گەمەکردن› ۳. *[ادبی]* بەختکردن؛ لە دەس‌دان ‹جان باختن: گیان بەخت‌کردن›. هەروەها: **باختنی**

■ صفت فاعلی: **بازنده** (ــ)/ صفت مفعولی: **باخته** (دۆڕاو)/ مصدر منفی: **نَباختن** (نەدۆڕاندن)

**ــ باخته** / bāxte/: *پیوازه.* ــ دۆڕاو؛ ــ دانیاو؛ ــ چویز؛ دانیاگ؛ دانریاگ؛ دۆڕیاگ ‹مال باخته: ماڵ‌دوراو›.

**باخدا** / bāxodā/: *صفت.* *[گفتاری]* خواناس؛ پیاو چاک.

**باد**[۱] / bād/: *اسم.* با؛ ڤا؛ وا؛ باگ؛ بای؛ بێ: ۱. /ـها/ شنانەوەی هەوا؛ حزیشکە: *الف)* بزوانی ئاسۆیی هەوا بەهۆی ناهاوسانی لە گوشاری کەشدا *ب)* جێ‌گۆڕکێی هەوا کە بە کەرەسەیێکی (وەک پانکە یان کرانەوە و درانەوەی درگا) بە شێوەی دەستکردی بەدی‌دێت ۲. *[گفتاری]* هەڵمساوی؛ پەنەماوی؛ هیزە ‹چرا صورتت باد کرده؟: بۆچی

سەر و چاوت بای کردووە؟› ٣. هەوا یان گازی ناو زگ ٤. هەوا یان گازێ کە بە تەوژمەوە بکرێتە ناو شتێکەوە ‹باد لاستیک: بای تەگەرە› ٥. [مجازی] باخر؛ باغر؛ بۆج؛ لووتبەرزی و بەدەماری ‹آقای وزیر خیلی باد داشت!: جەنابی وەزیر گەلێک بای هەبوو!› ٦. [مجازی] هیچ؛ پووچ؛ بە ڕواڵەت بەرچاو و بەکاکڵە بەتاڵ ‹حرفهایش همه باد بود: قسەکانی هەموو با بوو› ٧. [ادبی، کنایی] تاشک؛ توند؛ تیژ؛ چاوک ‹اسبی تیزرو چون باد: ئەسپی خۆشبەز وەکوو با›.

**باد آلیزه** ☜ **باد بِسامان**

**باد بِسامان:** بای شەماڵ؛ بایێکە لە لەتەگۆی باکووری زەویندا، لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە و لە لەتەگۆی باشووریدا لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵدەکا: **بادشرطه؛ باد تجاری؛ باد آلیزه**

**باد بهار:** ١. بای نەورۆزی؛ بای بەهار؛ واو وەهاری؛ واو واساری ٢. بایەک کە لە وەرزی بەهاردا دێت. هەروەها: **باد پاییزی؛ باد زمستانی؛ باد بهمن؛ باد دی؛ باد مهرگان**

**باد تجارتی** ☜ **باد بِسامان**

**باد تنجیده:** باگەڕ؛ باگەڕەوە؛ بایێک کە دوای بەرەو ڕوو بوون لەگەڵ لەمپەری وەککێو یان ماڵگەلی بڵندا، دەگەڕێتەوە و توندتر و بەگوڕتر دەبێ.

**باد جنوب:** زریان؛ زەلان؛ زلان؛ زەران؛ بای باشوور؛ بای قوبلە، کە سارد و تەزێنەرە.

**باد جنوب شرقی:** وەشت؛ بای باشووری ڕۆژهەڵاتی.

**باد خرمن:** بای شەن؛ بای خەرمان؛ نەرمەبای وەرزی، کە لە کاتی خەرمانان و شەنکردندا دێت. .

**باد خفیف:** نەرمەبا؛ شنە؛ بایێک کە خێرایی دەوری ٢١ تا ٣٢ کیلۆمیترە.

**باد دبور:** بایێک کە لە لای باشووری ڕۆژاواییەوە دێت.

**باد دماغ:** [کنایی] فیز؛ دەمار؛ دەعیە؛ لووتبەرزی؛ خۆ بە زل زانینی نارەوا.

**باد سام:** سەموون؛ سەبوون؛ ژارەبا؛ گڕەبا؛ گڕەبا؛ بای داخ و وشکی گەرمیان و چۆلگەی گەرم (وەک عەربسان و میسر) کە زۆرتر بەهاران و هاوینان هەڵدەکا.

**باد سحر:** شنەی بەربەیان؛ شنەی بەیانی؛ شنەی پای کاوان؛ بای بەیانی؛ شنەیەکی فێنک کە بەیانان هەڵدەکا: **باد صبح**

**باد سرخ:** [پزشکی] بای سوور؛ بای مبارەک؛ سوورەبا؛ نەخۆشیەکی گرانی پێستە: **سُرخباد**

**باد شُرطه** ☜ **باد بِسامان**

**باد شرقوزان** ☜ **باد قطبی**

**باد شکم:** خەمەرە؛ بای زگ؛ گازێک کە لە زگدا دروست دەبێ.

**باد شمال:** شەماڵ؛ بای باکوور.

**باد صبا:** سروە؛ شنەبا؛ شیبا؛ بایێ کە لە لای باکووری ڕۆژهەڵاتەوە یان باکووری ڕۆژئاواوە دێ و فێنک و لاوێنەرە.

**باد صبح** ☜ **باد سحر**

**باد صرصر:** سەرسەڕ؛ کزەبا؛ بای کزە؛ بای ساردی بە تەوژم.

**باد غبغب:** [کنایی] فیز؛ ئیفادە؛ دەعیە؛ دەمار؛ باخری؛ باغری؛ بایی هەوایی.

**باد غربوزان:** سیاوا؛ ڕەشەبا؛ بای لای ڕۆژهەڵات.

**باد فتق:** وەتەبا؛ قۆرسا؛ باگونە؛ قۆڕی؛ نەخۆشی گون ئاوسان.

**باد فرارو:** بایێ کە لە زەریا و زەمینگەلی نزمەوە بەرەو بەرزایی هەڵدەکشێ.

**باد فرورو:** باسەرێک کە لە بەرزاییەوە بەرەو دەشت و گۆڕایی بشنێتەوە.

**باد قطبی:** زاویتە؛ بارەش؛ با کووزک؛ بای هەرە ساردی بەر و بوومی سەر گۆی زەویـن کە بەرەو دەڤەرانی فێنکایی هەڵدەکا: **باد شرق‌وزان**

**باد کُنترآلیزە** ☜ **باد واسامان**

**باد گرم (آفت پالیز):** لیرگ؛ بای بەڵای بێستان.

**باد گلو:** یەق؛ قرپ؛ قڕقێنە؛ قورقێنە؛ قولقێنە؛ قورپینە.

**باد مخالف:** دژەبا؛ بای نەیار؛ ئەو بایە کە لە ڕووبەڕووەوە دێت و بەرهەڵستی کار کردنە.

**باد مرطوب:** نمەبا؛ شۆبا؛ بایێ کە تەڕایی پێوەیە.

**باد مفاصل:** */پزشکی/* ڕۆماتیسم؛ باداری؛ واداری.

**باد مقعد:** */مستهجن/* ۱. تڕ؛ زڕ؛ جڕ ۲. تس؛ فس.

**باد ملایم:** سۆسە؛ سووسە؛ نەرمەبا؛ بای نەرم؛ سریوە؛ بایێ کە خێرایی دەوری ۳۳ تا ٤۰ کیلۆمیترە.

**باد موافق:** ئەو بایە کە لە پشتە سەرەوە ئەنگێوێت و بزوان هاسان دەکاتەوە (بە تایبەت بۆ گەمیەی بادەوانی).

**باد موسمی:** بای وەرزینە؛ بای‌کژینە؛ کژەبا؛ وەرزەبا؛ بایێک کە لە وەرزێکی دیاریکراوی ساڵدا و لە ناوچەیێکی تایبەتدا هەڵدەکا.

**باد نسبتاً شدید:** فیزفیز؛ بایێک بە خێرایی ٤۱ تا ٥۰ کیلومتر لە ساعەتدا.

**باد نوروزی:** داراول؛ بایێک کە لە ڕۆژانی کۆتایی ڕەشەمە و لە سەرەتای جێژنی نەورۆزدا دەوەزێ.

**باد واسامان:** زەلان؛ زریان؛ بایێک کە شوێنی هەڵکردنی پێچەوانەی شەماڵە: **باد کُنترآلیزە**

**باد و بَروت:** فیز و ئیفادە؛ دەعیە و دەمار؛ ئینجەوفینجە؛ با و پف.

**باد هوا:** */گفتاری/* هیچ؛ پووچ؛ با؛ وا؛ فوو ‹با باد هوا نمی‌شود زندگی کرد: خۆ بە با ناکرێ بژی›.

⊡ **باد آمدن:** با هاتن؛ وا ئامەی؛ وا کەوتەی؛ با ئەنگوتن؛ با هەڵکردن.

**باد آوردن:** ۱. ماسین؛ باکردن ‹شکمش باد آوردە: زگی بای کردووە› ۲. با هێنان ‹این ابرها را باد آوردە: ئەم هەورانە با هیناونی›.

**باد بلند شدن:** باهەڵکردن؛ وا هۆرکەردەی ‹یک دفعه باد بلند شد و هر چه خاک بود ریخت روی سر و کلّەی ما: لەپڕ با هەڵیکرد و هەرچی خۆڵ بوو کردیە سەر و چاومانادا›.

**باد به/ در آستین انداختن:** */کنایی/* باڵەفشێ کردن؛ بە خۆ فشین؛ وا کەردەینەوێ؛ دەعیە و دەمار فرۆتن؛ فیز و ئیفادەکردن. هەروەها: **باد به بروت انداختن؛ باد به زیر بغل انداختن؛ باد به غبغب انداختن؛ باد در بینی انداختن؛ باد در کلاه انداختن**

**باد به بروت انداختن** ☜ **باد به/ در آستین انداختن**

**باد به پرچم/ بیرق کسی وزیدن:** */کنایی/* ئاو بە بێڵی کەسێکەوە بوون؛ ئاو لە جۆگەی کەسێکەوە چوون؛ کاری کەسێ سەرگرتن.

**باد به پشت کسی خوردن:** */کنایی/* ساردەوە بوون؛ بەهۆی ماوەیەک بێکاری، تەنبەڵ بوونەوە.

**باد به دست بودن** ☜ **باد به دست/ مشت داشتن**

**بـاد بـه دسـت/ مـشت داشـتن:** *[کنـایی]* بـا بـەدەسـت بـوون؛ دەسـتکورت بـوون؛ هـەژار و بێئەنوا بوون: **باد به دست بودن**

**بـاد بـه زیـر بغـل انـداختن** ☜ **بـاد بـه/ در آستین انداختن**

**بـاد بـه غبغـب انـداختن** ☜ **بـاد بـه/ در آستین انداختن**

**بـاد پیمـودن:** *[کنـایی]* باشـەن کـردن؛ کـاری بێهۆ کردن.

**باد خوابیدن:** با خەفتن؛ نیشتنەوەی با.

**باد خوردن:** ١. با لێدان؛ وا دایـوەنـه ‹خیس بود، گذاشـتەام بـاد بخـورد خـشک شـود: تـەڕ بـوو، دامنـاوه بـا لیبـدا وشـک بێتـەوه› ٢. *[کنـایی]* سـارد بوونـەوه ‹مـدتی بیکـار بـوده، پـشتش بـاد خورده، تن به کار نمی‌دهـد: مـاوەیـەک بێکـار بـوه، سارد بوتەوه، خۆی له کار نادا›.

**بـاد دادن:** ١. دانـەبـا؛ شـەن کـردن؛ دەی وارە؛ کێـشانه بـا ‹گنـدم را بـاد مـی‌دهنـد، از کـاه جدا شود: گەنم دەدەنـه بـا، لـه کـا جیـا بێتـەوه› ٢. *[کنایی]* با تێدان؛ بـا تێکـردن و فریـودان؛ بـا کردنـه قـول؛ هـەنی دانـه ژێـر بـاڵ؛ بـه ناکولـۆکاری کـەسـێ هـان دان: **بـاد در آستین کسی انداختن**

**بـاد داشـتن:** ١. بـا تێبـوون؛ بـادار بـوون ٢. *[کنایی]* بـەفـیس و دەمـار بـوون؛ لـووتبـەرز بـوون؛ بـاغر بـوون؛ بـادار بـوون؛ بـادی هـەوا بوون ٣. با هەبوون؛ پڕ له بـا بـوون (بـۆ تـۆپ و هەرچی بای تێ بکرێ).

**باد در آستین کسی انداختن** ☜ **باد دادن ــ٢**

**باد در بینی انداختن** ☜ **بـاد بـه/ در آسـتین انداختن**

**بـاد در چنبـر کـردن:** *[کنـایی]* ئـاو لـه دنگـا کوتـان؛ ئـاو بـه بێژنگـدا کـردن؛ کـاری بێکەڵک کردن.

**باد در سر داشتن:** *[کنایی]* له خـۆ بـایی بـوون؛ خۆ به زل زانین؛ بەدەعیه و دەمار بوون.

**باد در سرنا کردن:** *[کنایی]* پف پێدا کردن؛ قـوو داخـسـتن؛ دنیـا تـێ گـەیانـدن؛ نهـێنی وەدەرخستن.

**باد در کلاه انـداختن** ☜ **باد بـه/ در آسـتین انداختن**

**بـاد رهـا کردن:** *[مـستهجن]* بـا دانـەوه؛ وا وەردەی؛ تـڕان؛ تـڕەی؛ بـای زک خاڵـی کردنەوه.

**بـاد زدن:** ١. بـاوەشـێن/ بارۆشـەکـردن؛ وا درۆشەکەردەی؛ شـەماڵ پـەی کـەردەی؛ بـا خۆش‌کردن بۆ فێنکـی یـان بـۆ ئـاگر گـەش کردنـەوه ٢. بـا تێکـردن؛ وا کـەردەینـه ‹تلمبه را برداشت و هـر دو چـرخ دوچرخـه را خـوب بـاد زد: ترۆمپاکـەی هـەڵـگرت و هـەر دوو لاستیکی دووچەرخـەکـەی بـاش بـا تێکـرد› ٣. *[کنایی]* بـه گـوڵ گـرتن و بـه گـوڵاو شـۆردن؛ مـەشـەڕام کـەردەی؛ بـە دڵ و داوێـن ئاگاداری لـێ کـردن ‹انتظـار داری بـادت بـزنم: چـاوەڕوانی بـه گـول بگـرم و بـه گـولاو بتشورم؟›.

**بـاد کردن:** ١. پـەنـەمـان؛ پـەنـەمیـان؛ هـەڵماسـین؛ بـا کـردن؛ هـەڵمـسان؛ واکـەردەی ‹سـرم بـه دیـوار خـورد، بـاد کـرد: سـەرم دای لـه دیـوار، پـەنـەمـا› ٢. *[کنـایی]* باتێچوون؛ بـادار بـوون؛ بـایی بـوون؛ بـه خـۆ فشین؛ بادیهـوا بـوون؛ بـاغر بـوون ‹از وقتـی رییس شـده خیلـی بـاد کـرده: لـەو ڕۆژەوه بـووەتـه سەرۆک زۆر بـای نیچـووه› ٣. بـا تێکـردن (بـۆ تۆپ و تەگـەره و هـەرچـی بـای تـێ بکـرێ) ٤. *[کنایی]* کـەڕه هێنـان؛ بـه سـەر دەسـتەوه مان و نەفرۆشران.

**بادکسی را خواباندن:** فس کەسێ نیشاندنەوە؛ کەسێ له دەمار خستن؛ ژێرکردن.

**باد هوا خوردن:** *[کنایی]* بـا هـەڵمژین؛ هـیچ

نەخواردن ‹پول تمام شده و تا آخر ماه باید باد هوا بخوریم: پارە تەواو بووە و دەبێ تا ئاخری مانگ با هەڵمژین›.

**بر/ به باد دادن:** *[مجازی]* دانە با؛ بە با دان؛ فەوتاندن؛ لەکیس‌دان؛ مفت و مەرحەبا لە دەستدان.

**به باد چیزی گرفتن:** ۱. تێگرتن؛ دانە بەر شتێ ‹او را به باد ناسزا گرفت: دایە بەر پلار و جوین› ۲. پێ گەییشتن؛ پێوەتەقیان؛ پێوەندی سووک گرتن ‹هنوز باد شعله به او نگرفته بود که سوخت: هێشتا بڵێسەی ئاورەکەی پی نەگەیشتبوو، سووتا›.

**به باد فنا رفتن:** *[مجازی]* بە تووناى تووندا چوون؛ فەوتان؛ بە جاڕ و جەحانمدا چوون؛ نابووت بوون.

**باد**[2]: *دعا. [ادبی]* ببێ؛ بێ؛ بوێ؛ بۆ؛ بوود؛ با؛ بی ‹چنین باد: هەروا بی›: **بادا**

**بادا** / bādā/ ☜ **باد**[2]

▣ **بادا باد:** دەبێ با ببێ؛ بابۆ؛ ئەوەی دەبێ ببێ ‹زدیم بر صف رندان و هرچه بادا باد: هاتمە ریزی سەرپەتیان و هەرچی دەبێ با بێ›.

**بادآس** / bādās، ـهـا/: *اسم. [نامتداول]* ئاشی بادی؛ ئاسیاو بایی.

**بادآورد** / bādāvard، ـهـا/: *اسم.* ۱. ☜ **اَبلک** ۲. پوورئاشۆکە؛ پوورئایشێ؛ قومام؛ گیاگەنمە؛ گیایەکی خۆرسکە، لە مەزرای گەنمدا دەڕوێ.

**بادآورده** / bādāvarde، ـهـا/: *صفت. [کنایی]* بێ‌ڕەنج و بە خۆڕایی بە دەست هاتوو.

**بادآهنگ** / bādāhang/: *اسم. [ادبی]* ۱. ـهـا/ بائەنگێو؛ کونەبا؛ باکەش؛ بابوێر؛ باکێش؛ واگا؛ باگر؛ باگا ۲. پێژن؛ زایلە؛ زایەڵە؛ دەنگدانەوە.

**بادافره** / bādafrah/: *اسم. [ادبی]* سزا؛ جەزا؛ جزیا؛ تەمێ؛ جوابی خراپە.

**بادام** / bādām، ـهـا/: *اسم.* بادام؛ باوام؛ بادەم؛ بایەم؛ وادام؛ وایدم؛ باوی؛ باو؛ باقی؛ بایم؛ وامی؛ باهیر؛ باهیف؛ بەهێف؛ بەهیف: ۱. داری بادام ۲. دەنکی بادام؛ میوەی گەیشتووی داری بادام.

▣ **بادام تر:** چەقالە؛ چوالە؛ چۆلە؛ تەڕە بادام؛ بادامی تازە وا هێشتا تێکولی سەوز و کولکنە و سەخت نەبۆتەوە.

**بادام تلخ:** بادامی تاڵ؛ وامە تاڵێ؛ بایەمەتاڵە؛ چوالەتاڵە؛ بەهیڤەتەحلە؛ بایەمەکەتانی.

**بادام خاتونی:** بادامە گەڵوازە؛ وامە وەشێ؛ بادام کاغەزی؛ پستەبایەم؛ پستەبەهێف؛ بادامی شیرین بە تێکولی ناسک و تورتەوە: **بادام کاغذی؛ بادام منقّا**

**بادام خاکی** ☜ **بادامزمینی**

**بادام زمینی** ☜ **بادامزمینی**

**بادام سنگی:** بایەمە کوێرە؛ وامە کۆرێ؛ بایەمەڕەقە؛ جۆرێک بادام کە توێکڵی زۆر پتەوە.

**بادام سوخته** ☜ **بادامسوخته**

**بادام کاغذی** ☜ **بادام خاتونی**

**بادام کوهی:** بادامە کێفیلە؛ ئارژەنگ؛ ئەرژنگ؛ ئارژنگی؛ هەرجن؛ هەرجانە؛ وامە کەشێ؛ چلدسە؛ جۆرێ بادامی کێوی خۆرسکە.

**بادام منقّا** ☜ **بادام خاتونی**

**بادام هندی** ☜ **بادامهندی**

**چغالەبادام** ☜ **چغالە**

**مغز بادام** ☜ **مغز**

**بادامزمینی** / bādāmzamînî، ـهـا/: *اسم.* بادام زەوینی؛ بەهێڤەشامی؛ وەنەشامی؛ زرفستەق؛ گێزەرەمشکانە؛ پسەزەوینی: ۱. بنچکی بادام زەوینی ۲. دەنکی بادام

زەوینی: **بادام خاکی؛ پستەی زمینی؛ پستەی شامی**

**بادامستان** / bādāmestān، ـها/: *اسم*. باخی بادام؛ باخەبادام.

**بادامسوختە** / bādāmsûxte، ـها/: *اسم*. بادام سووختە؛ جۆرێ شیرنی کە بە شەکری تواوە و بادام دروست دەکرێ.

**بادامقندی** / bādāmqandî، ـها/: [فارسی/ معرب از سنسکریت] *اسم*. *[قدیمی]* ١. شەکەرەبادام؛ بادامی کوتراو لەگەڵ خاکەقەنددا ٢. شەکەرلەمە؛ جۆرێ شیرینی لە تیرەی قوتاب.

**بادامک** / bādāmak، ـها/: *اسم*. *[کالبدشناسی]* لووی؛ ئالوو؛ هاڵوو؛ لەوزە؛ گۆشەگەڵوو؛ گەوێ؛ هەرکام لە دوو لکی وەک بادامی بن گەروو.

**بادامە** / bādāme، ـها/: *اسم*. ١. تەتڵەمیوە؛ پیلە؛ کەلووی کرمی ئاوریشم؛ کلافەی کرمی هەورێشم ٢. نیشانە؛ خاڵی گۆشتین بە رووی پێستی مرۆوە ٣. باداموکە؛ هەرشتێکی وەک بادام.

**بادامهندی** / bādāmhendî/: *اسم*. بادام هیندی: ١. داری بادام هیندی ٢. /ـها/ دەنکی بادام هیندی کە خۆراکیە و لە ئاجیلەکانە.

**بادامی** / bādāmî/: *صفت*. بادامی: ١. وەک بادام ‹چشم بادامی: چاوی بادامی› ٢. /ـها/ بادامین؛ وامینە؛ بە بادامەوە ‹نان بادامی: نانی بادامی›.

**بادامیشکل** / bādāmîšekl/: [فارسی/ عربی] *صفت*. بادامی؛ وەک بادام؛ لە شەکڵ و بیچمی بادام.

**بادبادک** / bādbādak، ـها/: *اسم*. بادەوە؛ بەرزەحەوایلە؛ فڕۆنەک؛ کۆلارەی منداڵان؛ تەیارەی کاغەزی.

**بادبان** / bādbān، ـها/: *اسم*. بادەوان؛ بایەوان؛ یەلکەن؛ یەرکەن؛ پەردەئاسای گەمیەگەلی پێشوو کە بە هێزی با دەڕۆیشتن.

◘ **بادبان برافراشتن/کشیدن/گشودن**: ١. بادەوان هەڵدان ٢. *[کنایی]* ڕێکەوتنی گەمیە.

**بادبانماهی** / bādbānmāhî، ـها؛ ـان/: *اسم*. جۆرە ماسیێکی زەریای کارائیپ کە درێژی دوو میترە و باسکەکانی لە بادەوان ئەکەن.

**بادبانی** / bādbānî/: *صفت*. بادەوانی: ١. بەبادەوان ‹کشتی بادبانی: گەمیەی بادەوانی› ٢. شیاو بۆ بادەوان ‹پارچەی بادبانی: قوماشی بادەوانی›.

**بادبر** / bādbar، ـها/: *اسم*. ١. بافرە؛ گیزگیزە ٢. مزراح؛ مەزرێح؛ مزراق. ١و٢: دوو جۆر خولخولەی لە چێو چێکراون کە نێویان هەلکولۆشراوە، بەنیان بە دەورا دەپێچن و دەیانهاوێن، دەسوورنەوە و بۆڕەیان لێدێ *گردنا

**بادبر** / bādbor/: *صفت*. پەخ؛ خاوەن لێواری سوواو و لووس کراو.

**بادبزن** / bādbezan/: *صفت*. باوەشێن؛ بارۆشە؛ وادرۆشە؛ باوەشینک؛ بایوەشن؛ ئامرازێکی لە زەل یان پەلاستیک دروستکراو بۆ با وەدیهێنان بە مەبەستی خۆ فێنککردنەوە یان سوخاڵ گەش کردنەوە.

◘ **بادبزن برقی**: پانکە؛ پەنکە؛ بارۆشەی بەرقی؛ باوەشێنی کارەبایی.

**بادبزنی** / bādbezanî/: *صفت*. باوەشێنی؛ لە بیچمی بارۆشە.

**بادبند** / bādband/: *اسم*. *[فرهنگ‌مردم،قدیمی]* کەسێ کە بە نووشتە و ئەفسوون خەریکی دەرمانی بڕێک لە نەخۆشینگەلی (وەک سەر ئێشە، پشت ئێشە و ددان ئێشە) بوو. هەروەها: **بادبندی**

**بادپـا** / bādpā/: صـفت. [ادبی] خۆشـبەز؛ خۆشـڕەو؛ خۆشـڕۆ؛ بـەدەو؛ تاشـک؛ چابـک؛ چەلاک ‹اسب بادپا: ئەسپی خوشرەو›.

**بادخـان** / bādxān، ـهـا/: اسـم. [قـدیمی] بادگیر؛ بادگیرە؛ باکێش؛ بابوێر.

**بـادخور** / bādxor/: اسم. [مکانیک] بـاخوەر؛ بـاخوەرە؛ مـەودای نێـوان دوو کـەرسـتە لـە ماشینێکدا.

**بـادخیز** / bādxîz/: صـفت. باسـڕە؛ باسـەرە؛ بـاگر؛ بـەرەبـا؛ بـاڕۆگ؛ بـاپێچ؛ شـوێنێ کـە بـا بیگرێ ‹درەی بادخیز: دۆڵی باسرە›.

**بادرفـت** / bādroft/: اسم. [زمین‌شناسی] بـاڕن؛ گلێـرەوە بـووی بـن‌گرتـووی خاکـە نـەرمـەی ڕەنگ زەرد بـە هـۆی ڕامالـیان لـە شـوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر.

**بادرنجبویـه** / bādrancbûye، ـهـا/: [معـرب از فارسـی]/اسـم. شـاڕێحان؛ گیـا سـەودا؛ فاتمـە داروباخی؛ بارۆنـە؛ باڵـنگ؛ باڵـنگۆ؛ بـادرەنـگ؛ بادڕەنگ؛ گیایێکی گوڵ بەنەوشـی جـوان و زۆر بۆنخۆشە کە ئارەقەکەی بۆ خواردن و دەرمان بە کار دێ: **بادرنگبویه**

**بادرنگ** / bādrang/ ☜ **بالَنگ**

**بادرنگبویه** / bādrangbûye/ ☜ **بادرنجبویه**

**بـادروبش** / bādrûbeš/: اسم. بامـاڵ؛ کـار یـان ڕەوتی ڕامالـیانی مـەوادی (وەک ڕیـز و چـەو) لە ڕووی زەوین بە هۆی باوە.

**بادروج** / bādrûc/ ☜ **ریحان ـ۲**

**بادروگ** / bādrûg/ ☜ **ریحان ـ۲**

**بادزد** / bādzad/: اسم. بـاهووە؛ تنـەبـا؛ بـاگژە؛ قەرەهێڵ؛ گژەبا؛ بای لەپڕ و توند.

**بادزده** / bādzade/: صفت. باگـەسـتوو؛ باگـەز؛ زیان لێکەوتوو بەهۆی با لێدانەوە.

**بادسـنج** / bādsanc، ـها/: اسم. بـاپێو؛ ئـامێری ئەندازەگرتنی خێرایی با.

**بادسـوختگی** / bādsûxtegî/: اسم. باسـووتاوی؛ سووتانەوە و ئاڵۆشی پێست بـە بۆنـەی لێدانی بای وشک و گەرمەوە.

**بادسـوخته** / bādsûxte/: صـفت. سـووتاو بـە بۆنەی لێدانی بای وشک و گەرمەوە.

**بادشـکن** / bādšekan، ـهـا/: اسم. بابـڕ: ۱. [پزشکی] دەرمانێ کە خـەمـەرە و بـای گـەدە لا دەبـا ۲. [کشاورزی] بـاگر؛ ڕیزێـک لـە بنچکـە و داران کـە بـۆ کـەم‌کردنـەوەی هێـزی بـا چێنـرابێتن ۳. [معمـاری] دیـوارێ کـە بـەم مەبەستە داندراوە.

**بـادکرده** / bādkarde/: صـفت. [گفتـاری] هـەڵماسـیو؛ ماسـیو؛ بـاکردگ؛ ماسـا: ۱. هەڵپەنەمیو؛ هەڵـتۆقیو؛ ماسـیگ؛ پـەنـەمیـاگ ‹گونـەی بـادکردەاش از دور پیـدا بـود: گۆنـای هـەڵماسـیوی لـە دوورەوە دیـار بـوو› ۲. قوتـەوە بـوو؛ بـاکردوو؛ دەرپـەڕیـو ‹جیبهـای بـادکردە: گیرفانگەلی دەرپەڕیو›.

**بـادکش** / bādkeš، ـهـا/: اسم. باکـەش؛ حـەجـەم؛ کـەڵـەشـاخ؛ بـاکێش؛ دەفرێکـی گرۆڤـەری دەم ئـاوەلا کـە دەینێنـە شـوێنی ئێشەوە تا بـە گـەڕانی خـوێن لـەو جێگـەیـەدا کۆمەک بکا.

⊡ **بادکش کردن** ☜ **بادکش گذاشتن**

**بادکش گذاشتن**: بـاکێش پێـوەنـان: **بـادکش کردن**

**بادکنـک** / bādkonak/: اسـم. تیزانـگ؛ پفـدانک؛ میـزەلانی؛ کیـسەی (زۆرتـر پەلاستیکی) کـە فـووی تێـدەکـەن، کێـشی دێ و لەیستۆکی مندالانە.

**بادکنکی** / bādkonakî/: صفت. تیزانگی؛ وەک تیزانگ ‹آدامس بادکنکی: بنێشتی تیزانگی›.

**بـادگیر**[1] / bādgîr، ـهـا/: اسم. ۱. بـابوێر؛ بـاکێش؛ بـادگیرە؛ بـاچن؛ بـاخن؛ بـادەڵـێن؛ بـادرز؛ وادز؛ مەنارەئاسـایەکـی کـون‌ـکـون لـە برێک ناوچەی گەرم و بێ‌ئـاوی ئێران کـە لـە

سەر بانەوە سازی دەکەن تا لە درزەکانیەوە با دزەکاتە نێو ماڵەوە و فێنکی کاتەوە ۲. بابوێر؛ جۆرە؛ باکێش؛ بادگیرە؛ باچن؛ باخن؛ بادەڵێن؛ بادرز؛ وادز؛ دەربیژە یان ڕۆچنەیێک کە بۆ هەواکێشی لە خانوودا سازی دەکەن ۳. سەرەقلیان؛ دەفرێکی گرۆڤەری کون‌کون کە دەینێنە سەر ئاوری قلیانەوە بۆ ئەوەی با سکڵ و خۆڵەمێشەکە نەپرژێنێ ٤. بادگیر؛ جۆرە کاپشەنێکە بۆ بەرگری لە بەر با کەوتن یان تەڕ بوون بە هۆی با و بارانەوە.

**بادگیر**[2]: *صفت*. ۱. باگر؛ بەرەبا؛ لابا؛ لاباد؛ بائەنگێو؛ باپێچ؛ هەڵکەوت لە شوێنێ کە با دەیگرێ ۲. باگیر؛ بابڕ؛ بە تایبەتمەندی بەرگری‌کردن لە کاریگەری با.

**بادمجان** / bādemcān/ ☜ **بادنجان**

**بادنجان** / bādencān، ـها/: *اسم*. بامجان؛ بایەمجان؛ باینجان؛ بایمجان؛ باجان؛ باینجۆ؛ باجان‌ڕەشک؛ تەماتەسیاوێ: ۱. بنی گیای باینجان؛ یارەمای باینجان ۲. میوەی باینجان؛ باینجانە ڕەشە ❋ **بادمجان**

**بادنجان‌دورقاب‌چین**/ bādemjāndowreqābčîn, bādenjān-/: [فارسی/ عربی/ ترکی/ فارسی] *صفت*. *[مجازی]* ماستاوکەر؛ پیاز پاک‌کەر؛ باریک ڕێس؛ ماستاو ساردەوکەر؛ بڕێتی لە ڕووبین و کلکەسووتەکەر.

**بادنجانی**[1] / bādemcānî, bādencānî/: *اسم*. باینجانی؛ ڕەنگی بەنەوشی تۆخ.

**بادنجانی**[2]: *صفت*. باینجانی؛ بەڕەنگی بەنەوشی تۆخ.

**بادنقش** / bādnaqš، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم*. ڕەسمی شاندەری بار و خێرایی با لە ناوچەیەکدا ❋ **گُلباد**

**بادنگار** / bādnegār، ـها/: *اسم*. ئامێرێک کە خێرایی و بەری با بە شێوەی خۆمەش تۆمار دەکات.

**بادنگیر** / bādnagîr/: *صفت*. لابا؛ باپەنا؛ پەنابا؛ بانەگر؛ با پەسیو؛ ئەنوایەک کە با نەیگرێتەوە.

**بادنما** / bādnemā، ـها/: *اسم*. کەرەسەیێک پێکهاتوو لە تێخە و پایەیێک کە بە هەر بارێکدا با بێت دەسووڕێ و بەم جۆرە شوێنی هاتن و چوونی با دەردەخا.

**بادوبروت** / bād-o-burût, -borût/: *اسم*. *[کنایی]* فیس؛ دەمار؛ لووتبەرزی؛ لە خۆدەرچوویی؛ دفن‌بلندی؛ گەوەزەیی؛ بە خۆ فشینی.

**بادە** / bāde/: *اسم*. *[ادبی]* بادە؛ شەراب؛ شەراو؛ مەی.

▣ **بادەی انگوری**: شەراوی ترێ؛ شەراو.

**بادەی ناب**: شەراوی بێ‌خەوش.

**بادەپرست** / bādeparast، ـها؛ ـان/: *صفت*. *[ادبی]* بادەپەرست؛ هۆکارە بە شەراب و خواردنەوەی ئەلکولی: **بادەپرستی**

**بادەفروش** / bādefurûš، ـها؛ ـان/: *اسم*. *[ادبی]* بادەفرۆش؛ فرۆشیاری خواردنەوەگەلی ئەلکولی. هەروەها: **بادەفروشی**

**بادەگساری** / bādegosārî/: *اسم*. *[ادبی]* بادەخۆری؛ مەیڤەخۆری.

**بادی**[1] / bādî/: *صفت*. بایی؛ بادی: ۱. پێوەندیدار بە باوە ۲. تایبەتمەندی کەرەسەیێک کە بە با کار دەکا ‹ساز بادی: سازی بادی› ۲. سەر بە شتێ یان ئامرازێ کە بە گوشاری با کار دەکا ‹تفنگ بادی: تفەنگی بادی›.

**بادی**[2]: *قید*. *[ادبی]* سەرەتا؛ دەسپێک.

▣ **بادی امر**: سەرەتای کار؛ دەسپێکردنی کار.

**بادیان** / bādiyān/ ☜ **رازیانە**

**بادیس** / bādîs/ ☜ **باتیس**

**بادی‌گارد** / bādîgārd، ـها/: [انگلیسی] *اسم*.

پـاریزەر؛ کەسێ کە پاراستنی گیانی کەسایەتیەکی لە بەرانبەر هەر چەشنە هەڵمەت و پەلامارێکەوە بە ئەستۆیە.

**بادیه** / bādiye، ـها/: [از عربی]/اسم. ۱. باییه؛ بایە؛ کاسەی گەورە ۲. //ادبی/ بیاوان؛ دەشت؛ سارا؛ چۆڵگە؛ چۆڵگە؛ وشکانی؛ وشکارۆ.

**بادیەنشین** / bādiyenešîn، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. دەشتەکی؛ بیاوانی؛ چۆڵنشین؛ چۆڵگەنشین؛ یاوەنشین.

**بار¹** / bār/: اسم. بار: ۱. /ـها/ هەر شتێک (بێجگە مرۆ) کە دەبێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر ڕاگوێزرێتەوە ‹ویژەی حمل بار: تایبەتی گواستنەوەی بار› ۲. هەرشتێک کە ئەرک و زەحمەتی بکەوێتە سەر شتێکیتر ‹نگهداری از برادرزاده‌اش، باری بر دوش او بود: ڕاگرتنی برازاکەی بارێ بوو بە سەر شانیەوە› ۳. /ـها/ ئەوەندە لە شتێ کە بە جارێک بگۆزرێتەوە ‹دو بار هندوانه: دوو بار شووتی› ٤. پیزە؛ تۆڵ؛ ساوای ناوزگ؛ بێچووی هێشتا نەزاو ‹همسرش دیروز به سلامت بارش را به زمین گذاشت: خێزانی دوێنێ بەسەلامەت بارەکەی دانا› ٥. بەر؛ میوە؛ بەرهەم؛ باهر ‹درخت را از بارش می‌شناسند: دار بە بەریەوە دەناسن› ٦. بۆخ و سپیایی سەر زمان ‹زبانش بار دارد: زمانی باریگرتووە› ۷. /مجازی/ دژواری؛ مەینەت؛ ئەرک ‹بار زندگی: باری ژیان› ۹. [فرانسوی/ انگلیسی] /ـها/ مەیخانە.

▣ **بار خاطر**: باری دڵ؛ هۆی دڵتەنگی و لەش بەباری؛ کوڵی دڵ؛ کوڵی دەروون.

**بار زندگی**: /کنایی/ نالەباری ژیان؛ بارگرانایی ژیان.

**بار عام**: بەرایی گشتی؛ ڕێگەدانی هەموانی بۆ چاوپێکەوتنی شا یان خاوەن دەستەلاتێک.

**بار غم**: /کنایی/ باری خەم؛ باری جەخار؛ قورسایی و گوشاری خەم.

**بار کج**: /کنایی/ باری چەوت؛ باری لار؛ باری گێڕ؛ کاری نابەجێ و نەگونجاو.

▣ **بار آمدن**: ڕاهاتن؛ بارهاتن؛ پەروەردە بوون؛ خاراو بوون. هەروەها: **بار آوردن**

**بار بردن** ☜ **بار کشیدن**

**بار بستن**: /کنایی/ ۱. بارگە تێکنان؛ بار بەستن؛ بار بارکردن؛ بار لێنان؛ خۆ پێچانەوە؛ وێ پێتەیوە؛ کۆڵ پێتەیوە؛ ساز و ئامادە بوون بۆ سەفەر ۲. بارەمەند بوون؛ دەوڵەمەند بوونەوە و کەیفساز بوون.

**بار به زمین گذاشتن**: /کنایی/ زایین؛ زان؛ زاین؛ زەی؛ بار لێبوونەوە؛ مناڵ هێنان؛ بێچوو دین.

**بار خود را بار کردن** ☜ **بار خود را بستن**

**بار خود را بستن**: /کنایی/ کەری خۆ بەستنەوە؛ باری خۆ لێ بار کردن؛ باری خۆ نیانە بارخانە؛ پووڵ و پارەی چاک (زیاتر بە ناڕەوا) دەستخستن: **بار خود را بار کردن؛ خود را بستن**

**بار دادن**: بەرایی پێدان؛ وەردەی؛ بەردان؛ ڕێدانی کەسێکی خاوەن دەستەلات (زیاتر پادشایان) بۆ هاتنە ژوورەوە و چاوپێکەوتنی خەڵکی.

**بار دوش کسی شدن**: /کنایی/ سەرباری کەسێک بوون؛ بوونە مل کەسێکەوە؛ بوونە ئەرک و زەحمەت بە سەر کەسێکەوە.

**بار زدن**: بارکردن؛ بار لێنان؛ بار نانە سەر بارهەڵگر: **بار کردن**

**بار کردن**: بارکردن؛ بارکەردەی: ۱. بار لێنان: **بار زدن** ۲. لێنان؛ نیەی سەر؛

چێشت لێنـان ۳. *[کنایی]* داسـەپانـدن؛ پێـدا دان؛ بـەزۆر سـەپانـدن بـە سـەر شـتێکەوە ‹کُلّی فحش و بد و بیراه بـارم کـرد: زۆر جنێـو و ناڕەوای بارکردم›.

**بـار کـشیدن:** بارکێـشان؛ بـار بـردن؛ بـار هەڵگرتن؛ بار هۆرگێرتەی: **بار بردن**

**بار گذاشتن:** نانـەبـان؛ لێنـان؛ نیـەی سـەر؛ چێـشت و خـواردەمـەنی نانـە سـەر ئـاورەوە بـۆ کـولان ‹آبگوشـت بارگذاشـتن: ئاوگۆشـت لێنان›: **بار کردن**

**بار یافتن:** بـە خزمـەت‌گـەیـشتن؛ گـەیـشتنە بـەر بـارەگـا؛ سـەرکـەوتـن بـە دیـداری کەسایەتیەکی گەورە (زیاتر پادشایەک).

**بـار** [۲]: *قید.* ڕا؛ جـار؛ کـەڕەت؛ گلـە؛ گلۆنـگ؛ کـووڵ؛ ڕەو؛ تـەنـگ ‹صد بـار؛ چنـد بـار؛ سە بـار: سەد جار؛ چەن ڕا؛ سێ گلە›: **بارە**

**ـ بـار** [۳]: *پیـوازە.* ــ بـار: ۱. ــ بـارێن ‹اندوهـبـار: خەمبار› ۲. ڕۆخ؛ لێو؛ لێـوار؛ بـەستێن؛ کـەنـار ‹دریابـار؛ رودبـار: زریبـار؛ ڕووبـار› ۳. داهـات؛ دەسـکەوت؛ بـەرهـەم؛ بـەر ‹خـشک‌بـار: وشکەبار›.

**بـارآور** / bārāvar/: *صفت.* بـارەوەر؛ بـەرەوەر؛ وەچـدەر: ۱. پـڕداهات؛ بـەردەر؛ بـەردار؛ بـەرهێنـەر؛ بـەرهـەمهێنـەر؛ داهـات‌هێنـەر؛ دەسـکەوتـدار ‹درخـت بـارآور: داری بـەرهێنـەر› ۲. بـە قـازانج؛ قـازانج‌هێنـەر؛ قازانجـدەر ‹فعالیت بـارآور: تێکۆشـانی بـەقـازانج› ۳. بـەردار؛ باردار؛ پڕبەر. هەروەها: **بارآوری**

**بـاران** [۱] / bārān/: *اسـم.* واران؛ بـاران؛ یـاخر؛ یاخەر: ۱. ئـاوێ کـە لـە ئاسمانـەوە بـە تنۆکـە دێتە خـوار ۲. *[مجازی]* ڕێژنـە؛ ڕێـزە؛ ڕژانی بـە لـووزەوی شـتـێ ‹بـاران اشـک؛ بـاران رحمـت: بارانـی فرمێسک؛ بارانـی ڕەحمەت›.

◙ **بـاران اسیدی:** ڕەشـەبـاران؛ بـارانی تێکـەڵ بە دووکەڵ و پیسی.

**بـاران خـشک:** ئیـشکە بـاران؛ وشـکەبـاران؛ بارانـێ کـە لـە بـڕێ چۆڵـگەی گـەرمێنـدا دەبـارێ و بـەر لـەوەی بگاتـە زەوی دەبێتەوە هەڵم.

**باران خون:** سوورەباران؛ بارانە خـوێن؛ بارانـێ کە لـە گـەڵ تـەپ و تـۆزی سـووری هـەوادا تێکەڵ دەبێ و سوور هەڵدەگەڕێ.

**بـاران‌کـوهزاد:** بارانـە؛ بارانـێ کـە بـەهـۆی هەبوونی کێو لە ڕێی هەوردا دەبارێ.

**باران مـصنوعی:** بـارانی دەسـکرد؛ ئـەو بارانـە کە بە ئاوس‌کردنی هەور دایدەبارێنن.

**بـاران موسـمی:** کـژە بـاران؛ بـارانی وەرزانـە؛ وەرزە بـاران؛ ئـەو بارانـە کـە لـە وەرزێکـی تایبەتی ساڵدا دەبارێ.

**بـاران نـم‌ـنـم:** نمـە؛ وەشـت؛ بـاڕێزە؛ ڕێـزە بـاران؛ نـەرمـە بـاران؛ خـونقین؛ خوناوکـە؛ بارانی لە سەر خۆی و وردیلە.

◘ **بـاران باریـدن:** بـاران بـارین؛ واران وارەی؛ باران داکردن؛ داڕژانی باران.

**بـاران خـوردن:** بـاران لێـدان؛ واران کەوتـەی؛ واران دەیونـە؛ کەوتنـە بـەر بـاران و تەڕ بوون لە ژێر باراندا.

**بـاران زدن:** بـاران لێـدان؛ واران دایـوەنـە؛ بـارینی بـاران بـە سـەر شـتێک یـان شوێنێکدا.

**باران گرفتن:** داکـردنی بـاران؛ بـاران بـارین؛ دادانی باران؛ واران گێرتەینە.

**ـ باران** [۲]: *پیـوازە.* ــ بـاران؛ ــ واران؛ داڕژانی بـە لـووزەوی شـتـێ ‹گلـباران؛ نوربـاران: گوڵـباران؛ نوورباران›.

**بارانـداز** / bārandāz، ـهـا/: *اسـم.* ۱. بـارەنـداز؛ بارەنناز؛ جێگەی خستنی بـار ۲. *[ـان]* بـارداگر؛ بارخاڵیکەر؛ کرێکاری بەندەر کە باری گەمیە بار دەکا و دایدەگرێ.

**بارانـدن** / bārāndan/: *مـصدر. متعـدی.*

//باراندی: باراندت؛ مـی‌بـارانی: ده‌بـاریێنی؛ بِبـاران: ببارێنـــه// بارانـــدن؛ داباراندن؛ وارنـــه‌ی؛ ئـــه‌ره‌وارنـــه‌ی؛ دارژانـــدنی شـــتێک ‹سـنگ باراندن؛ نور باراندن: بـه‌رد باراندن؛ نـوور بارانـدن›: **بارانیدن**. هه‌روه‌ها: **باراندنی**

■ صـفت فـاعلی: **باراننـــده** (بارێنـــه‌ر) / صـفت مفعـولی: **بارانـــده** (بـــارێنراو) / مـصدر منفـی: **نَباراندن** (نه‌باراندن)

**بـــارانزا** / bārānzā/: صـــفت. بـــارانزا؛ بـــاران‌هێنـــه‌ر؛ پێکهێنـــه‌ری بـــاران یـــا هـــۆی به‌دیهاتنی ‹ابرهای بارانزا: هه‌ورانی بارانزا›.

**بـاران‌سـنج** / bārānsanc/، ـها/: اسم. شه‌پێو؛ باران‌پێو؛ ئـامرازێ بـۆ دیـاری‌کـردنی ئـه‌نـازه‌ی بـاران لـه درێـژه‌ی مـاوه‌یـه‌کـی دیـاریکراودا. هه‌روه‌ها: **بارش‌سنج**

**بـــاران‌ســـنجی** / bārānsancî/: اســـم. باران‌پێوی؛ لقێـک لـه زانـستی بـووم‌ناسـی کـه له چۆنایه‌تی بـاران بـارین و بـلاو بوونـه‌وه‌ی لـه شـــوێنگه‌ل و وه‌رزگـــه‌لی جۆراوجـــۆردا ده‌کۆڵێته‌وه: **بارش‌سنجی**

**بـــارانگیر** / bārāngîr، ـهـا/: اسـم. پاســـار؛ پاسـاره؛ سـوانه؛ گوێـسوانه؛ سـوانده؛ سـه‌رسـا؛ سه‌ر پاساری مـالان بـۆ بـه‌رگـری لـه دڵـۆپه‌ی باران.

**بـــاران‌نگـــار** / bārān.negār، ـهـا/: اسم. باران‌پێو؛ شه‌پێـو؛ ئـامرازی بـاران‌پێـوی کـه بـه شـێوه‌ی خۆمـه‌ش ئـه‌نـدازه‌ی بـارین لـه بـان شـــریتێکه‌وه ده‌نـــه‌خـــشێنێ. هـــه‌روه‌هـــا: **بارش‌نگار**

**بـارانی**[1] / bārānî، ـها/: اسم. بـارانی؛ جلێکـی ئاودامانه که بـۆ تـه‌ڕ نـه‌بـوونی جلـی ژێـر و لـه کاتی باراندا ده‌یکه‌نه به‌ر.

**بـــارانی**[2]: صـفت. بـــارانی: ١. هـــی بـــاران؛ پێـــوه‌ندیـــدار یـــان ناســـراو بـــه بارانـــه‌وه ‹پـالتو بارانی: پالـتاوی بـارانی› ٢. بـه بـاران؛ پڕ بـاران؛

بـاراندار ‹روز بارانی: رۆژی بارانی›.

**بارانیدن** / bārānîdan/ ☜ **باراندن**

**بـــاربر** / bārbar، ـهـا؛ ـان/: اسم. بـــاره‌بـــه‌ر؛ خـــه‌ره‌کـــدار: ١. پـــا هـــه‌ڵـــگیر؛ کۆڵـــکێش؛ کۆڵه‌به‌ر؛ کۆڵبه‌ر؛ حـه‌مـاڵ؛ بـاره‌کـی؛ هـه‌مـل؛ باره‌هـه‌ڵـگر؛ بـارکێش ٢. بـاره‌بـه‌ر؛ چـوارپێی باری؛ هه‌رچـی (بـه تایبـه‌ت چوارپـێ) کـه بـاری بکه‌ن و باری پێ ڕاگوێزن.

**بـاربری** / bārbarî/: اسـم. ١. /ـهـا/ بارکێـشی؛ کـــۆڵ‌کێـــشی؛ بـــاره‌بـــه‌ری؛ کۆڵـــبه‌ری؛ بارگوێزانـــه‌وه؛ کـــاری کۆڵـــکێش ٢. /ـــهـــا/ باربـه‌ری؛ بـارگوێزی؛ بنکـه‌یـه‌ک کـه کـاری بـــردن و گوێزانـــه‌وه‌ی بـــاره ٣. حـــه‌قـــی بـــار؛ پاره‌ی پێویست بۆ گواستنه‌وه‌ی بار.

**باربند** / bārband، ـها/: اسم. باربه‌ن: ١. شـوێنی باردانان له‌بـان ماشـینه‌وه ٢. گـورێس؛ بـارپێچ؛ وه‌رێسه؛ شریتێ که باری پێ ده‌به‌سنه‌وه: **بارپیچ** ٣. په‌چه؛ به‌هاربه‌ند؛ ته‌وێڵه‌ی سه‌رنـه‌گـیراو بـۆ یه‌کسم. هه‌روه‌ها: **بهاربند**

**بارپیچ** / bārpîč/ ☜ **باربَند ـ٢**

**بارتنگ** / bārtang/ ☜ **بارهَنگ**

**بـــاردار** / bārdār/: صـفت. ١. بـاردار؛ زگ‌پـڕ؛ ئـاوس؛ لـه‌مـه‌پـه‌ڕه؛ دووگیـان؛ دوه‌گیانـه ٢. بـه‌بـار؛ بـاردار؛ تـه‌مـدار یـان تـه‌مگرتـوو ‹زبان بـاردار: زمـانی بـاردار› ٣. بـه‌ردار؛ پڕبـه‌ر؛ بـه‌رهـه‌مدار؛ خـاوه‌ن میـوه. هـه‌روه‌هـا: **بـاردار بودن؛ باردار شدن؛ باردار کردن**

**بـــارداری** / bārdārî/: اســـم. زگ‌پـــڕی؛ ســـک‌پـــڕی؛ ئاوســـی؛ بـــارداری؛ ئاڤـــزی؛ له‌مه‌په‌ڕی؛ دووگیانی.

**باردان** / bārdān/ ☜ **باباآدم**

**بـــارده** / bārdeh/: صـفت. بـــه‌رهـــه‌مـــده‌ر؛ وه‌چـــده‌ر؛ وه‌چـــوه‌بـــه‌ر؛ بـــه‌رده‌ر؛ خـــاوه‌ن تایبه‌تمه‌ندی به‌رگرتن، به‌تایبه‌ت میوه دان.

**بـــاردی** / bāredî/: [عربـی]اسـم. *[نامتـداول]*

لاقردی؛ گولمەزی؛ لاقرتی؛ بارهنگێڤی؛ ئاکاری تێکەڵ بە گاڵتەوگەپ.

**باردیچ** / bārdîč/:اسم. پێلۆژە؛ تەنوورماڵ؛ تەنوورسڕ؛ ئەو پەڕۆ تەڕەی کە بە سەر دارێکەوە دەیبەستن، بۆ خاوێن کردنەوەی دیواری تەنوور.

**بارز** / bārez/: [عربی] صفت. ئاشکرا؛ دیار؛ بەرچاو؛ وەرەچەم؛ لە بەرچاو؛ گت؛ ڕەپ؛ قیت؛ زۆپ؛ بارزەقە؛ بازرە؛ بە دەرەوە؛ زەق.

**بارزد** / bārzad، ـها/:اسم. گیانوزینە؛ باڕیزە؛ گیایێکی ئاڵفیه بە گەڵای کەسکی ئاماڵ خۆڵەمێشی و پۆشتە بە ڕشتەگەلی ورد و گوڵی هێشووئاسای زەردەوە، کە بۆ دەرمان دەشێ.

**بارسکپ** / bāroskop، ـها/: [؟]/اسم. باروسکۆپ؛ جۆرێ تەوژمپێو.

**بارسنج** / bārsanc، ـها/:اسم. قەپانیار؛ ئاوەڵقەپان؛ کەسێ کە بار دەکێشێ.

**بارش** / bāreš، ـها/:اسم. وارشت؛ بارشت؛ باڕژن؛ وەشت: ۱. ڕەوتی بارین ۲. ڕەوتی دابارینی بەفر و باران یان تەرزە.

**بارش‌سنج** / bāreššanc/ ☜ **باران‌سنج**

**بارش‌سنجی** / bāreššancî/ ☜ **باران‌سنجی**

**بارش‌نگار** / bārešnegār/ ☜ **باران‌نگار**

**بارفروش** / bārfurûš، ـها؛ ـان/:اسم. بارفرۆش؛ فرۆشیاری گەورەی میوە و سەوزی؛ ئەو کەسە میوە و ئاوەڵەکانی بە کۆ دەسێنێ و دەیانفرۆشێ. هەروەها: **بارفروشی**

**بارفیکس** / bārfîks، ـها/: [فرانسوی]/اسم. *[ورزش]* باڵفیکس: ۱. لوولەیەکی دوو سەر دابەستراو بۆ خۆ هەڵواسین پێدا، بە مەبەستی وەرزش کردن ۲. وەرزشێک کە بەو لوولە دەکرێ.

**بارقه** / bāreqe، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* تیشک؛ تیسک؛ ترووسک؛ ڕووناکی؛ پرشنگ؛ تیجیە؛ گەشە ‹بارقەی اُمید: تیشکی هیوا›.

**بارک‌الله** / bārekallāh, bārakallāh/: [عربی] *دعا*. ئافەرین؛ بارەکەڵلا.

**بارکد** / bārkod، ـها/: [انگلیسی]/اسم. بارکود؛ نوانە؛ نیشانەیەک بە شێوەی چەن هێڵ و ژمارە لە سەر بەستەگەلی کەلوپەل کە بۆ ژماردن و تۆمارکردنی ناوەڕۆکی بەستەگەل بە کار دێت.

**بارکش** / bārkeš، ـها/: *صفت*. بارکێش؛ باری؛ بارینە؛ بارەبەری بە هێز ‹اسب بارکش: هێستری بارکێش›.

**بارگاه** / bār(e)gāh، ـها/:اسم. بارەگا: ۱. دەزگا و خانووبەرەی گەورە پیاوان؛ بارگا ۲. نەزرگە؛ نزگە؛ قسن؛ گۆڕخانەی پیاوچاکان کە خەڵک دەچنە زیارەتی ۳. *[ورزش]* حەسانگەی شاخەوانان؛ جێگای وچان و پاڵدانەوەی کەشەوانان لە ناوقەدی کێودا.

**بارگنج** / bārgonc، ـها/:اسم. کانتینر؛ جۆرێ ماڵووکەی کانزایی بۆ بار گواستنەوە.

**بارگه** / bārgah/:اسم. *[مخفف، ادبی]* بارگە؛ بارەگە؛ بارەگا.

**بارگیری** / bārgîrî/:اسم. ۱. بارگیری؛ کاری گرتن یان هەڵگرتنی بار بۆ بردن لە جێگەیەکەوە بۆ جێگایەکی‌تر ‹بارگیری کشتی: بارگیری کەشتی› ۲. ☜ **باروری ـ ۴**

**بارم** / bārem، ـها/: [فرانسوی]/اسم. بارۆم؛ پێومانی وانە، نرخ، مز و...

**بارنامه** / bārnāme، ـها/:اسم. بارنامە: ۱. بەرگەی نیشاندەری جۆر، کێش و ژمارەی بەستەی بار و ناو نیشانی بنێر و بگر ۲. لاپەڕەی لە چاپ دراو کە حکوومەت بەو مەبەستە دەیدا بە بنکەگەلی ڕاگوێزان.

**بارندگی** / bārandegî، ـها/:اسم. بارین؛

باران؛ وارەی: ۱. بارشت ‹در موقع بارندگی از چتر استفاده می‌کنیم: لە کاتی باریندا لە چەتر کەلک وەردەگرین› ۲. ئەوەی کە دەبارێ (وەک باران یان بەفر) ‹امسال بارندگی خوبی داشتیم: ئەمسال بارینێکی باشمان هەبوو›.

**بارو** / bārû، ـها/:/سم. بارووم؛ وارش؛ شویرهە؛ شورا؛ شووار؛ سوور؛ سوورە؛ دیواری دەوری باخ و ماڵ و بێستان.

**بارو‌بندیل** / bār-o-bandîl، ـها/:/سم. /گفتاری/ بارگەوبنە؛ باروبنە؛ باروبەن؛ باروبەندیل.

**بارو‌بنه** / bār-o-bone، ـها/:/سم. بارگە؛ بار و بنە؛ بار و بەن؛ پێداویستی سەفەر.

**باروت** / bārût/: [ترکی از فرانسوی]/سم. بارووت؛ دەرموو؛ شۆرە؛ دەرمان تفەنگ؛ ماکەی بارووت.

▣ **باروت بی‌دود:** جۆرێ بارووت کە دوای سووتان هیچی لێ نامێنێتەوە.

**باروت پنبه:** پێفۆ؛ پەمۆی تەقینێ؛ شتێکی پەمووئاسایە کە بە خۆیەوە گڕ دەگرێ.

**باروت سیاه:** قەرەبرووت؛ بارووتی ڕەش.

**باروتی** / bārûtî/: [ترکی] صفت. بارووتی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە بارووت ۲. بە ڕەنگی بارووت.

**بارور** / bārvar/: صفت. ۱. بەروەر؛ بەردار؛ وەچدەر؛ بارهێنەر؛ خاوەن دەسهات یان مێوە ۲. خاوەن توانایی بۆ: *الف)* ئاوس بوون *ب)* بەردان؛ داهات دان؛ بەرهەم دان ۳. قازانجدەر.

▣ **بارور شدن:** بەردار بوون؛ میوەگرتن.

**بارور کردن:** بەردارکردن؛ بەرهەمدارکردن؛ بەبەر کردن.

**باورسازی** / bārvarsāzî، ـها/:/سم. بە بەرکردن؛ بەروەرکردن؛ بەردار کردن؛ بەرگر کردن: ۱. کار یان ڕەوتی بەرهەمدارکردن (بەگشتی) ۲. کار یان ڕەوتی بەرهەمدار کردنی ڕووەک ۳. باردار کردن؛ کار یان ڕەوتی ئاوس‌کردنی گیانلەبەران.

**باروری** / bārvarî، ـها/:/سم. بەرەوەری: ۱. کار یان ڕەوتی بەرهەمدان؛ داهات‌دان ۲. کار یان ڕەوتی قازانجدان ۳. کار یان ڕەوتی تێکەڵاو بوونی خانگەلی زایەند لەگەڵ یەکتر و مەیینی لە پزداندا ٤. تێکەڵاوی دەنکی گەردە لەگەڵ هێکۆکەدا: **بارگیری_۲**

**باروک** / bārok/: [فرانسوی از ایتالیایی]/سم. بارۆک: ۱. شێوازێک لە نژاریدا کە لە کۆتاییەکانی چەرخی ١٦ی زایینی لە ئیتالیاوە سەری هەڵدا و دوا جار لە سەرتاسەری ئورووپای ڕۆژئاوادا برەوی سەند، لە تایبەتمەندیەکانی، ئازادی و سەربەستی لە گەلالە ڕشتندا بوو ۲. شێوازێک لە مووسیقای ڕۆژئاوادا کە لە نژاری بارۆکەوە سەرچاوەی گرتووە و لە ئاسەواری یووهان سێباستیان باخ (١٧٥٠-١٦٥٥ زایینی) گەیشتە سەر ترۆپکەوە.

**باروگراف** / bārog(e)rāf، ـها/: [انگلیسی]/سم. تەوژمنووس؛ گوشارنووس؛ ئامێرێک بۆ نیشاندانی ئاڵوگۆڕگەلی گوشاری کەش بە شێوەی نەخشاندن، لە ماوەیێکی دیاریکراودا: **فشارنگار**

**بارومتر** / bārometr، ـها/: [فرانسوی]/سم. تەوژمپێو؛ گوشارپێو؛ ئامێرێک بۆ هەڵسەنگاندن و دیاری‌کردنی گوشاری کەش: **فشارسنج**

**بارون** / bāron، ـها/: [فرانسوی]/سم. بارۆن: ۱. نازناوی کۆنی پیاو ماقوولانی ڕۆژاوایی ۲. ئاغا؛ ئەفەندی؛ وشەی ڕێز نان بۆ پیاوی ئەرمەنی.

**باره**[1] / bāre/:/سم. ۱. /ـها//ادبی/ بارووم؛ سوور؛ وارش؛ شویرهە؛ دیواری دەوری باخ

و مـاڵ و... ٢. بـاره؛ واره؛ چـەمـک؛ بابـەت؛ ئـەوەی قـسەی لێـوە دەکـەن ‹در ایـن بـاره بـه کـسی چیـزی نگـو: لـەم بـارەوە بـە کـەس هـیچ مەڵێ›.

**ـ باره** [٢]: *پیواژه.* ــواز: ١. ــ بـاره؛ ــواره؛ جـار؛ گەڕ؛ کـەڕەت ‹دوبـاره: دووبـاره› ٢. *[ادبی]* ــ باز؛ ــخواز؛ خوازیار ‹زنـباره: ژنباز›.

**بارهنـــگ** / bārhang، ـهـا/: *اسم.* ڕێکێـشە؛ ڕکێـشە: ١. ڕووکێـشە؛ هـەڕکیـشە؛ ڕاکیـشە؛ هلەگشە؛ زمانەبـەرخ؛ گـەڵادمـەڵ؛ گـوێ بزنـە؛ گیادووپـشک؛ گیایـەک بـە گـەڵای گـەورە و چڕ خـەفتـگ و گوڵـی کـۆ و هۆشـەییـەوە کـە بۆ بان برین بە کـار دێ: **چرغـول؛ زبـان‌بـرّه** ٢. دانەی ورد و سـوور و ئـاوداری ڕکێـشە کـە بـۆ دەرمانیش بە کار دێ ✻ **بارتنگ**

**باری** [١] / bārî/: *اسم. [گفتاری]* بـاری؛ عـاره بانـە؛ ماشـینی تایبـەتی گوێزانـەوەی بـار ‹اثـاث را بـا بـاری فرسـتادیم و خودمـان سـوار تاکـسی شـدیم: شـتومـەکـەکانمـان بـە بـاری نـارد و خۆمـان سەواری تاکسی بووین›.

**بـاری** [٢]: *صفت.* بـاری؛ شـیاوی بارگۆزاسـتنەوە ‹قطار باری: قەتاری باری›.

**باری** [٣]: [فرانسوی] *اسم. [فیزیک]* بـاری؛ یـەکـەی گوشار، بەرانبەری $10^{-1}$ پاسکاڵ.

**بـــاری** / bārî: *قیـــد. [ادبـــی]* ئـــەیچـــی؛ بەهەرحاڵ؛ هـەر چۆنێـک بێـت؛ ئـەی؛ بـەڵـێ؛ ئـەیچـە؛ ئـەیچـێش ‹بـاری، دردسـرتان نـدهم، همـەاش همـین بـود کـه گفتم: ئـەیچـی، سـەرتـان نەیشێنم، هەمووی ئەمە بوو کە گوتم›.

⊡ **باری بـە هـر جهـت کـردن:** *[کنایی]* دەسـت لـە سـەر دەسـت دانـان؛ ئـەم دەسـت و ئـەو دەسـت‌کـردن؛ کـەمتـەرخـەمـی کـردن؛ دەسـاودەس‌کـردن؛کردوکـۆش نـەکـردن؛ دانیشتن و هەوڵ و تەقالا نەدان.

**بـــاری‌تعـــالی** / bārîta'ālā/: [عربـــی] *اســـم.* خـــودای مـــەزن؛ بینـــایی‌چـــاوان؛ بینایی‌چەهڤان؛ خوای گەورە.

**باریجـــه** / bārîce/: *اسـم.* بـاڕیزە؛ شـیرەی ڕیشەی گیای باڕیزە.

**باریـــدن** / bārîdan/: *مـصدر. لازم. متعـدی.* // **باریدی:** باریـت؛ **مـی‌بـاری:** دەبـاری؛ **ببـار:** ببـارە// ◻*لازم.* ١. دابـــارین؛ بـــارین؛ ڤـــارین؛ وارەی؛ وارای؛ هاتنـەخـواری بـەفـر و بـاران؛ وەشـتەی ‹بـرف باریـدن: بـەفـر بـارین› ◻ *متعـدی* ٢. داڕێژانـــدن؛ بارانـــدن؛ دابارنـــدن؛ وارنـــەی؛ وارنایرە. هەروەها: **باریدنی**

■ صـفت فـاعلی: **بارنـــده** (ـــ)/ صـفت مفعـولی: **باریده** (باریو)/ مصدر منفی: **نَباریدن** (نەبارین)

**باریـک** / bārîk، ـهـا/: *صفت.* ١. باریـک؛ زراڤ؛ تـەنـگ؛ تـەنگـەبـەرە؛ بـە پانـایی کـەمـەوە ‹کوچـەی باریـک: کـۆڵانی باریـک› ٢. باریـک؛ زراڤ؛ نازک؛ ناسـک؛ بـە ئـەسـتووری کـەمـەوە ‹ریـسمان باریـک: پـەتی باریـک› ٣. *[مجـازی]* ورد؛ ڕێـز؛ پێویـست بـە ورد بوونـەوەی زۆر؛ جـێ تێبـینی ‹نکتـەای باریـک: خاڵـێکی ورد› ٤. *[مجازی]* باریکەڵە؛ باریکڵە؛ لەڕ؛ لاواز؛ لاغر.

**باریـک‌انـدام** / bārîkandām، ـها؛ ـان/: *صفت.* بـەژن‌زراڤ؛ بـەژن‌باریـک؛ باریکـەلانـە؛ باریکـەلانـە؛ باریـک و لـەڕ؛ باریکـڵە (بـۆ نێـر)؛ باریکڵێ (بۆ مێ)؛ خلۆپە؛ ناسک و تەنکەڵە.

**باریـک‌انـدیش** / bārîkandîš، ـها؛ ـان/: *صفت.* وردبـین: ١. خـاوەن بـیری ورد و ڕێـک ٢. تیژبین؛ وریا؛ وشیار؛ لە سەرهۆش.

**باریـک‌اندیـشی** / bārîkandîšî، ـهـا/: *اسم.* وریـابیری؛ بیروریـایی: ١. دۆخ یـان چۆنیـەتی وردبینی ٢. کار یان ڕەوتی بە وردی بیرکردنەوە و لێکدانەوەی وردەکاریگەل یان دیاردەگـەل و بابەتگەلی ورد.

**باریک‌بین** / bārîkbîn، ـها؛ ـان/: *صفت.* وردەبین؛ وردبین.

**باریک‌بینی** / bārîkbînî، ـها/:اسم. وردەبینی؛ وردبینی: ١. بار یان چۆنیەتی وردبین بوون ٢. کار یان ڕەوتی بینین بەوردی لە سەر دیاردەگەل یا شتێکی ورد.

**باریکە** / bārîke، ـها/:اسم. باریکە؛ زولاک؛ شەلیت؛ تەسکە؛ ڕیوالە؛ تیزمالک؛ بەشێکی باریک و درێژ لە شتێک ‹باریکەی آب: باریکەی ئاو›.

**باریم** / bār(i)yom/: [انگلیسی از فرانسوی] /اسم. باریۆم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٥٦ و کێشی ئەتومی ١٣٧,٣٤ سپی زێوین و چەکوشخۆر، کە لە سروشتدا بە شێوەی تێکئالاوی هەیە.

**باز**[1] / bāz، ـها/:اسم. باز: ١. [فرانسوی] /شیمی/ بەرانبەری ترش (ئەسید) ٢. /ـان/ بازی؛ پەلەوەری ڕاوچی.

◙ **باز سفید**: شاباز؛ بازیسپی.

**باز گنجشک‌خوار** ☜ **قرقی**

**باز**[2]: صفت. باز؛ واز؛ وا؛ ولنگ: ١. بە بێ گیر و لەمپەر ‹لولەی باز؛ جادەی باز: لوولەی باز؛ ڕێگەی واز› ٢. بە بێ گرێ یان تەنراوی ‹کلاف باز: پاری باز› ٣. والا؛ وەلا؛ ئاوالە؛ ئاوەلا؛ کراوە؛ تاک؛ بە بێ‌بەسیان ‹پنجرەی باز: پەنجەرەی باز› ٤. بە بێ هۆکاری گیر و گرفت ‹ذهن باز: بیری باز› ٥. لە دۆخی کاردا ‹مدرسە باز است: قوتابخانە بازە› ٦. کراوە؛ وەکری؛ قەکری؛ خاوەن مەودا لە یەکترییەوە ‹پاهای باز: پێی باز›.

◘ **باز شدن**: کرانەوە: ١. کریایوە؛ باز بوون ‹باز شدن راه: کرانەوەی ڕێگا› ٢. باز بوون؛ ئەوەکریەی؛ واز بیەی ‹باز شدن قفل: باز بوونی قوفل› ٣. دەست پێ کرن ‹باز شدن مدرسە: کرانەوەی قوتابخانە› ٤. ڕەوینەوە؛ لاچوونی هەور؛ چاوکردنەوەی ئاسمان ‹باز شدن هوا: ڕەوینەوەی هەور›.

**باز کردن**: کردنەوە: ١. بازکردن؛ کەردەیوە؛ کردنەڤە؛ وەرکردن؛ چەکانن؛ درگا یان بەرهەلستێک لە سەر ڕێ لادان یان لابردن ‹در را بازکردن؛ چشم را بازکردن: درگا کردنەوە؛ چاو کردنەوە› ٢. /مجازی/ ڕوونکردنەوە؛ لێلایی تاراندن؛ کردنەوە؛ بازکردن ‹چشم و گوش کسی را بازکردن: چاو و گوێی کەسێ کردنەوە› ٣. ڕاخستن؛ پانکردنەوە؛ ئاوەلاکردن؛ وەلا کەردەیوە؛ یاوایرە ‹سفرە را بازکردن: سفرە ڕاخستن› ٣. خستنەوە ڕێ؛ کەردەیوە ‹مغازە را بازکردن: دووکان کردنەوە› ❊ **گشودن**

**باز گذاشتن**: ١. نەبەستن ٢. بەرگر دروست نەکردن ٣. دانەپۆشین؛ نەپۆشنایرە. هەروەها: **باز بودن**

**باز**[3]: قید. ١. دیسان؛ هەمیسان؛ دیسانەوە؛ هەمیسانەوە؛ دیسا؛ هەمیس؛ هەمیسا؛ ئەمجاریش؛ دووبارە؛ نۆر؛ سەرلەنوێ؛ هەم؛ گر؛ لە ژنوو؛ جارێتریش ‹باز بە تو پول میدهم: دیسان پارەت پێ دەدەم› ٢. هێشتا؛ هێشتاکانێ؛ هێشتاکوو؛ هێشتاکینێ؛ هێشتان؛ هێشتانەکێ؛ هێشتانێ؛ هەلای؛ هەلەی؛ هەنی؛ هنی؛ هێشتەی؛ هێما ‹این همە پوشیدەام، باز سردم است: ئەم هەمووەم کردۆتە بەر، هێشتا سەرمامە›.

**باز**[4]: پیشوانژە. ئەو ـ ؛ ـئەوە؛ ئەوە ـ ؛ وە ـ ؛ ڤە ـ ؛ ـۆ؛ ـوە؛ ئەوا ـ : ١. /ادبی/ نیشانەی دووپاتەکردنەوە یان تازەکردنەوە؛ دیسانەوە ‹باز پختن؛ بازشناختن؛ بازیافتن؛ باز نهادن: کولاندنەوە؛ ناسینەوە؛ دۆزینەوە؛ دانانەوە› ٢. نیشانەی گەڕانەوە یان بەرەو دوا چوون ‹باز آوردن: هێنانەوە› ٣. بەر ـ ؛ نیشانەی بەرگری ‹بازداشتن: بەرگرتن› ٤. ناو ساز دەکا ‹بازپرسی: وەپرسی/ پرسینەوە›.

**ـ باز**[5]: پیوانژە. ـباز؛ ـواز: ١. خۆشەویست؛

خوازیار ‹کفتربـاز: کـۆتربـاز› ٢. ئـەنجـامدەری کارێـک ‹چتربـــاز: چـەتـربـاز› ٣. بـوونی هـەڵـسوکـەوتێـک ‹حقـەبـــاز: فێڵـــباز› ٤. /ادبی/ ئامـاده بـۆ بـەخـت‌کـردنی شـتێک ‹سـەربـــاز: سـەربـاز› ٥ . ـەوە؛ ـەوە؛ ـئـەوە؛ لـە کاتێکـەوە بـەرەو ئـەمـلا ‹از دیـربـــاز او را می‌شناختم: لە مێژەوە دەمناسی›.

**بـازآرایی** / bāzārāyî، ـهـا/:/اسم. کـار یـان ڕەوتی ڕازاندنـەوە؛ تـەوزاندنـەوە؛ نـەژرنـایوە: /الـف) ڕێـکـوپێـک‌کردنـەوە ب) دارِشـتنەوە؛ لەسەرِرا و بە شێوازێکی تازە دامەزراندنەوە.

**بازآفریدن** / bāzāfarîdan/: مصدر. متعدی. /ادبی/ ١. چـێ‌کرنـەوە؛ دروسـەو کـردن؛ وەشـەوە کـەردەی؛ دووبـاره دروسـت‌کردنـەوە ٢. ئافراندنەوە؛ خولقاندنەوە؛ لە نـەبوو هـەمیسان چێ‌کرن. هەروەها: **بازآفریدنی**

**بـازآفرینی** / bāzāfarînî، ـهـا/:/اسم. /هنر/ ئافراندنـەویـی؛ کـار یـان ڕەوتی خولقاندنـەوە؛ بەدیهێنانەوەی شتێ.

**بازآمـدن** / bāzāmadan/: مـصدر. لازم. /ادبـی/ هاتنـەوە؛ هاتنـەڤـە؛ گـەرِانـەوە؛ گەرِیانـەوە؛ هەڵـەوگەرِیان؛ ئـەوەئامـەی؛ ئامـایـوە؛ ئـەوەگێڵەی؛ لـە جێیـەکـی‌تـر هاتنـەوە بـۆ جێگەی پێشوو. هەروەها: **بازآمدنی**

■ صـفت فـاعلی: **بازآورنـده** (ــ)/ صـفت مفعـولی: **بازآمـده** (وەهـاتوو)/ مـصدر منفـی: **بازنَیامـدن** (نەهاتنەوە)

**بـازآموختن** / bāzāmûxtan/: مـصدر. متعـدی. لازم. /ادبـی/ □ متعـدی. ڤـەهـەڤـۆتن: ١. فێرکردنەوە؛ تێ‌گەیاندنـەوە؛ ڤـەهـەوساندن □ لازم. ٢. فێـر بوونـەوە؛ تـێ‌گـەیـشتنەوە. هەروەها: **بازآموختنی**

■ صـفت فـاعلی: **بازآموزنـده** (فێـرەوەکـەر)/ صـفت مفعـولی: **بازآموختـه** (فێـرەوەکـراو)/ مـصدر منفی: **بازنَیاموختن** (فێرنەکردنەوە)

**بازآموزی** / bāzāmûzî، ـها/:/اسم. ١. کـار یـان ڕەوتی فێرکردنەوە؛ دووباره فێرکـردن بـۆ تـازە کردنـەوە یـان تـەواوکـردنی ئاگـەداری ٢. فێـر بوونەوە.

**بـــازآوردن** / bāzāvardan/: مـصدر. متعـدی. هێنانـەوە؛ هانینـەوە؛ ڤـەئینـان؛ گێرِانـەوە؛ ئاردەیـوە؛ ئـەوە ئـاردەی؛ هاوردنـەوەی شـتێک بۆ جێگای پێشووی. هەروەها: **بازآوردنی**

■ صـفت فـاعلی: **بازآورنـده** (وەهێنـەر)/ صـفت مفعـولی: **بـــازآورده** (وەهێنـراو)/ مـصدر منفـی: **بازنَیاوردن** (نەهێنانەوە)

**بازار** / bāzār، ـها/:/اسم. بـازار؛ بـازار: ١. بـاژێر؛ سـووک؛ وازار؛ شـوێنی‌سـەودا و مامـەڵـە ٢. /مجازی/ سـەودا؛ مامـەڵـە ‹بـازار گندم رونـق دارد: بازاری گەنم گەرمە›.

▣ **بـازار آزاد**: بـازاری ئـازاد؛ بازارێـک کـە نرخەکانی بە پێی پیشاندان و داواکارییە.

**بـازار بـورس**: بـازاری بـوورس؛ شـوێنی سەودای زێرِ و زیو و نەوت و...

**بازار بی‌رونق** ☜ **بازار کساد**

**بـازار بـین‌المللـی/ جهـانی**: بـازاری نێونەتـەوەیـی؛ بازاری جیهـانی: ١. شـوێنێ کە لـە لایـەن وڵاتگـەلی جۆراوجـۆرەوە کـاڵا بـۆ فـرۆش دادەنـرێ ٢. پیـشاندان و داوای کاڵاگـەلی دیـاریکراو لـە بـازارِی وڵاتـانی جۆربەجۆردا.

**بـازار حقیقی**: بـازاری ڕاسـتەقینـە؛ بازارێـک کە کووتاڵی ئـەسڵ و ڕاسـتی تێـدا پیـشان دەدرێ.

**بـازار داخلـی**: بـازاری نـاوخۆ؛ بـازاری پیـشاندان و داخوازیکـاری (عرضـە و تقاضـا) لە ناو وڵاتدا. هەروەها: **بازار خارجی**

**بـازار روز**: بـازاری ڕۆژ؛ بـازاری ڕۆژێ دیاریکراو لە حەوتوودا.

**بـازار سـالانە**: بـازاری سـاڵانە؛ بازارێـک کـە

سالێ جارێک لە جێیەک و لە وەرزێک لە ساڵدا پێک دێت. هەروەها: **بازار هفتگی**

**بازار سلف:** بازاڕی سەلەم؛ بازاڕی پێش فروش.

**بازار سیاه:** ڕەشە بازار؛ بازاڕی ڕەش؛ شوێنی سەودای کالا، دوور لە چاوی قانوون.

**بازار شام:** *[کنایی]* بازاڕی شام؛ گاڵە بازار؛ جێگایەکی گورمۆڕە و هەڕێژراوە.

**بازار عمدەفروشی:** بازاڕی عومدەفرۆشی؛ جێگایەک کە کالای تێدا بە سەرجەم و یەکجێ دەفرۆشن و دەکڕن. هەروەها: **بازار خردەفروشی**

**بازار عمومی:** بازاڕیگشتی؛ بازاڕێ کە کووتاڵی جۆراوجۆری بۆ هەموو کڕیاران تێدایە. هەروەها: **بازار اختصاصی**

**بازار فروش:** بازاڕی فرۆش؛ ڕەوتی فرۆشتن بەهۆی هەموو یان زۆربەی فرۆشیارانەوە ‹بازار فروش نفت رونق دارد: بازاڕی فروشی نەوت بەبرەوە›. هەروەها: **بازار خرید**

**بازار کار:** بازاڕی کار ‹هر سال تحصیلکردەهای بیشتری وارد بازار کار میشوند: هەموو سالێ خوێندەوارانێکی زیاتر دەچنە نێو بازاڕی کارەوە›.

**بازار کساد:** بێبازاڕی؛ بازاڕی کەساد؛ بازاڕی کەساس؛ بازاڕی بێکڕیار: **بازار بیرونق**. هەروەها: **بازار راکد**

**بازار گرم:** بازاڕی گەرم؛ گەرمەبازار؛ قرمە بازار؛ بازاڕی پڕ لە کڕیار. هەروەها: **بازار داغ**

**بازار محلی:** بازاڕی خۆماڵی؛ بازاڕی ناوخۆیی.

**بازار مسگران:** بازاڕی مسگەران. هەروەها: **بازار آهنگران؛ بازار حلبیسازان؛ بازار زرگران؛ بازار کفاشان**

**بازار مشترک:** کۆبازێڕ؛ یەکگرتوویی ئابووری نێوان کڕیاران و فرۆشیارانی دوو یان چەند وڵات.

**بازار مصرف:** سەودای کەلوپەل. هەروەها: **بازار تولید**

**بازار مکارە:** بازاڕی نیشانگە؛ جۆرێ بازاڕی کاتی کە پێکهێنەران و فرۆشیاران کووتاڵی خۆیانی تێدا نیشان دەدەن و دەکرێ ناوچەیی، وڵات بە وڵات یان نێونەتەوەیی بێ.

▣ **بازار پیدا کردن:** بازاڕ پەیا کردن؛ بازاڕ دیتنەوە؛ دۆزینەوەی کڕیار بۆ شتێک.

**بازار چیزی را شکستن:** بازاڕی شتێ شکاندن؛ ساردکردنەوەی بازاڕی شتێک؛ لە برەو خستنی فرۆشی شتێ.

**بازار خوابیدن:** *[مجازی]* بازاڕ خەوتن؛ نەبوون یان کەم بوونەوەی سەندن و فرۆشتنی شتێک ‹مدتی است بازار خوابیدە و هیچ معاملەای صورت نمیگیرد: ماوەیێکە بازار خەوتووە و مامەلە نیە›.

**بازار داشتن:** بازاڕ هەبوون ‹قالی خوب همیشە بازار دارد: قالی چاک هەمیشە بازاڕی هەیە›.

**بە بازار بردن:** بۆ بازاڕ بردن؛ بردنە بازاڕ (بۆ فرۆش).

**بە بازار رفتن:** چوون بۆ بازاڕ (بۆ سەندن).

**بازارپژوهی** / bāzārpajûhî، ـها/: *اسم.* بازاڕتۆژی؛ بازار پەیدۆزی؛ بازار هووریێنی؛ لێکۆڵینەوە لە داخوازگەلی بازاڕ و بەراوردی داهاتوو لەمەر بازاڕی شتێکەوە و دۆزینەوەی بازاڕ بۆ بەرهەمێک.

**بازارپسند** / bāzārpasand، ـها/: *صفت.* ڕووبازاڕ؛ بەبرەو؛ شتێ کە بازاڕی چاکی هەبێ؛ پەسندی

فرۆشیار و کڕیار.

**بازارچە** / bāzārče، ـھا/: اسم. بازارچە؛ تاریکەبازاڕ؛ بوارگەیێکی زۆرتر سەرداپۆشراو، بە چەند دووکانی هەموو جۆرەوە.

**بازارشکنی** / bāzāršekanî، ـھا/: اسم. بازاڕشکێنی؛ کار و ڕەهاتی فرۆشتن بە نرخی خوارتر لە بازاڕ بۆ بێبازاڕی باقی فرۆشیاران یان ڕکەبەران.

**بازارگرمی** / bāzārgarmî، ـھا/: اسم. بازاڕگەرمی؛ گەرمبازاڕی؛ بە شتێکدا هەڵگوتن بۆ فرۆشتنی.

**بازاری**[1] / bāzārî، ـھا؛ ـان/: اسم. بازاڕی؛ دووکاندار؛ ئەوەی لە بازاردا کار دەکات بەتایبەت ئەگەر کاری فرۆشتن و سەندن بێ.

**بازاری**[2]: صفت. بازاڕی: ١. سەبارەت بە بازاڕ ٢. [مجازی] بێبایەخ لە باری هونەریەوە.

**بازاریاب** / bāzāryāb، ـھا؛ ـان/: اسم. بازاڕدۆز؛ کەسێک یان بنکەیەک کە کاری پەیدا کردنی بازاڕە بۆ کالا.

**بازاریابی** / bāzāryābî، ـھا/: اسم. بازاڕدۆزی: ١. کار یان ڕەوتی دیتنەوەی کڕیار ٢. کاری بازاڕدۆز.

**بازالت** / bāzālt/: [فرانسوی] اسم. [زمین‌شناسی] پازار؛ بەردە ڕەشە؛ جۆرێ بەردی سەخت و وردیلە و ڕەنگاوڕەنگ.

**بازبین** / bāzbîn، ـھا؛ ـان/: اسم. پشکێنەر؛ دۆزەرەوە؛ وەدۆز؛ ئەواوین؛ وەبین؛ کەس یان دەزگایەک کە کاری دووبارە بینینەوەیە.

**بازبینی** / bāzbînî، ـھا/: اسم. ١. کار یان ڕەوتی پشکنین؛ بینینەوە؛ وینایوە؛ وەدۆزین ٢. کار یان ڕەوتی پێدا چوونەوە؛ چاوخشاندن؛ ئەوە وینەی.

**بازپخت** / bāzpoxt/: اسم. کار یان ڕەوتی کوڵاندنەوە؛ کوڵانەوە؛ ئەوەگرینەی؛ گرینایوە؛ کوڵاندنەوەی شتێک.

**بازپختن** / bāzpoxtan/ ☜ **باز**[4]**ـ۱**

**بازپرداخت** / bāzpardāxt/: اسم. دانەوە؛ گەڕاندنەوەی وام ‹بازپرداخت این وام پنج ساله است: دانەوەی ئەم قەرزە پێنج ساڵەیە›.

**بازپرس** / bāzpors، ـھا؛ ـان/: اسم. بازپرس؛ ڤەپرس؛ کەسێ کاری پرسینەوە بۆ ناسینی تاوانبار و دەرخستنی ڕاستیە.

**بازپرسی** / bāzporsî، ـھا/: اسم. پێچانەوە؛ ڤەپرسی؛ بازپرسی؛ پرسینەوە و بە سەر کردنەوە بۆ دەرخستنی ڕاستی و ناسینی تاوانبار.

**بازپرسیدن** / bāzporsîdan/: مصدر. لازم. [ادبی] پرسینەوە؛ ڤەپرسین؛ ئەوەپەرسەی؛ پەرسایوە؛ دیسان پرسین ‹بازپرسید چرا رفت و چرا آمد: پرسیەوە بۆ چوو و بۆ هات›.

■ مصدر منفی: **بازنپرسیدن** (نەپرسینەوە)

**بازپروری** / bāzparvarî، ـھا/: اسم. چاکردنەوە؛ سازکردنەوە: ١. کار یان ڕەوتی گەڕاندنەوەی ساغی و هێزی لەش، بە تایبەت بە وەرزش، خواردنی دروست و حەسانەوە ٢. کار یان ڕەوتی ڕاهێنان و چاک کردنی ئازوبەزکاران و تاوانباران و تەیارکردنیان بۆ هاتنەوەیان بۆ ناو کۆمەڵ.

**بازپس** / bāzpas/: قید. [ادبی] ١. دواوە؛ دماوە؛ وەدوا؛ بەدوا؛ پەشتیەرە؛ لپەی؛ لدویڤ ٢. بەدوا؛ بەرەو شوێن یان کاتی پێشوو.

⊡ **باز پس آوردن**: هاوردنەوە؛ گەڕاندنەوە؛ دانەوە؛ ئاردەیوە؛ ئەوە ئاردەی.

**باز پس رفتن**: چوونەوە؛ بە دواوە چوون؛ بەرەو دوا چوون؛ پەشتیەرە لوەی.

**باز پس گرفتن**: سەندنەوە؛ ساندنەوە؛ ئەسایوە؛ ئەوە سانەی.

**باز پس نگریستن**: بەرەو دوا نوارین؛ بۆ دواوە ڕوانین؛ دیایرە دماوە؛ دواوە

مەیزین؛ پشتەسەر چاو لێکردن.

**بازتاب** / bāztāb ـھا/:/اسم. ۱. کار و ڕەوتی هەڵگەڕانەوە؛ ڤەدان؛ دانەوە؛ ئەوەدەی ۲. *[روانشناسی]* چەڵەکانەوە؛ سڵەمیانەوە؛ بەرپەرچی ناویستی گیانەوەر لە بەرانبەر زیخانەوە(تەحریک)دا ۳. ڕەنگدانەوە؛ دەنگدانەوە؛ شوێنەواری بار و دۆخێکی روون ‹بازتاب وسیع: رەنگدانەوەی بەربڵاو›

**※انعکاس**

**کمان بازتاب ☜ کمان**

**بازتاباندن** / bāztābāndan/: مصدر. متعدی. تێگرتنەوە؛ دیسان تێگرتن؛ ئەوەتاونەی ‹نور را بە نقطەی قرمز بازمی‌تابانیم: تیشکەکە بەرەو خاڵی سوور تێدەگرینەوە›. هەروەها: **بازتاباندنی**

**بازتابیدن** / bāztābîdan/: مصدر. لازم. هەڵگەڕانەوە؛ ئەوەتاویەی؛ ڤەتەیسین ‹نور ماه از آینە بازمی‌تابید: شەوقی مانگ لە ئاوێنەکەوە هەڵدەگەڕایەوە›. هەروەها: **بازتابیدنی**

**بازتوانی** / bāztavānî/:/اسم. توانینەوە؛ کار یان ڕەوتی هێنانەوەی ساغی، سەربەخۆیی یان کارزانی نەخۆش لە زووترین ماوەدا: **توانبخشی**

**بازجست** / bāzcost ـھا/:/اسم. داباش؛ کار یان ڕەوتی وەدۆزین؛ وەگەڕان؛ پەیدۆزی و هلکەوشاندنی شتێک.

**بازجستن** / bāzcostan/: مصدر. متعدی. گەڕانەوە؛ هلکەڤاشتنەڤە؛ ئەوەگێڵەی؛ دیسانەوە لە شوێنی شتێک گەڕان.

**بازجو** / bāzcû ـھا؛ ـیان/:/اسم. لێکۆڵەر؛ ڤەکۆڵەر؛ مرۆی شارەوانی کە پێش هاتنی لێپرسەر، لە تاوانبارکراوان و لایەنانی شەڕ کورتە لێکۆڵینەوەیەک ئەکات و ئاگاداریەکانی ــ بۆ بڕیاردانی دوایی ــ بۆ دادسەرا دەبات.

**بازجویی** / bāzcûyî ـھا/:/اسم. ڤەکۆڵی؛ لێپرسینەوە؛ لێکۆڵینەوە لە تاوان؛ چنەوە پەرسەی. هەروەها: **بازجویی شدن؛ بازجویی کردن**

**بازخرید** / bāzxarîd ـھا/:/اسم. کرینەوە: ۱. سەندنەوە؛ ساندنەوە؛ ئەسایوە؛ سانایوە؛ کرینەوەی دووبارەی شتێکی فرۆشراو ۲. بە پارە ڕزگارکردنی دیل یا کۆیلە ۳. کرینی یەکجاری ماف و مزی کەسێک لە مەزرینگەیەکدا بۆ لاچوونی لە کار.

هەروەها: **بازخرید شدن؛ بازخرید کردن**

**بازخریدن** / bāzxarîdan/: مصدر. متعدی. *[ادبی]* کرینەوە؛ ساندنەوە؛ سەندنەوە؛ ئەوەئەسەی؛ سانایوە؛ دووبارە کرینی شتێ کە فرۆشراوە و بە کەسێ‌تر دراوە. هەروەها: **بازخریدنی**

**بازخواست** / bāzxāst ـھا/:/اسم. ۱. وەخواست؛ کار یان ڕەوتی لێ‌ویستنەوە؛ لێ‌ویستن؛ خواستنەوە؛ چنەواسەی؛ تۆژینەوە لە تاوانبارکراو لە مەڕ هەڵەکاری یان کەمتەرخەمی لە ئاکاریدا ۲. *[مجازی]* سەرزەنشت؛ سەرکۆنە؛ سەرکۆ؛ لۆمە.

هەروەها: **بازخواست شدن؛ بازخواست کردن**

**بازخواندن** / bāzxāndan/: مصدر. متعدی. *[ادبی]* وەخۆندن: ۱. بانگ‌کردنەوە؛ قاوکردنەوە؛ ئەوەچریەی؛ چریەیوە؛ بەسەرکردنەوە؛ کەسێک بانگ‌کردن بۆ گەڕانەوەی ۲. پێدا چوونەوە؛ دوبارە خوێندنەوە؛ ئەوەوەنای؛ ئەوەوەنتەی؛ هەمیسان خوێندنەوەی نووسراوەیەک.

هەروەها: **بازخواندنی**.

**بازدادن** / bāzdādan/: مصدر. متعدی. *[ادبی]* دانەوە؛ پێدانەوە؛ وەدان؛ دانەدواوە؛ ئەوەدەی؛ دایوە. بەرانبەر: **بازگرفتن**.

هەروەها: **بازدادنی**

**بازدار** / bāzdār ـھا؛ ـان/:/اسم. بازیار؛ بازدار؛ واشەدار؛ واشەباز؛ بازەوان؛ بازەباز؛ کەسێ

کە کاری پاراستن و پەروەراندنی مەلانی ڕاوکەرە.

**بازدارنده** / bāzdārande، ـها؛ ـگان/: *صفت.* پێشگر؛ پێشگرەوە؛ بەرپێگر؛ خاوەن تایبەتمەندی یان برستی بەرگری کردن لە ئەنجامدانی کارێک ‹نیروی بازدارنده: هێزی پێشگر›.

**بازداری** / bāzdārî/: *اسم.* ١. بازەوانی؛ بازبازی؛ لێزانی لە ڕاگرتن و ڕاهێنانی مەلانی ڕاوچی ٢. /ـها/ *[روان‌شناسی]* خۆ ڕاگرتنی ئەنقەست لە وەرامدانەوە بە بزوێنەرگەل.

**بازداشت** / bāzdāšt، ـها/: *اسم.* ١. ڕاگرتنی کەسێک لە جێیەک بە پێچەوانەی ویستی خۆی، نەخوازا ڕاگرتنی تاوانبار لە گرتووخانە یان لە بەندیخانەدا ٢. قۆڵبەس؛ دەزگیرکردنی کەسێک بۆ ئەم مەبەستە * **توقیف**. هەروەها: **بازداشت بودن؛ بازداشت شدن؛ بازداشت کردن**

**بازداشتگاه** / bāzdāštgāh، ـها/: *اسم.* گرتووخانە؛ گرتۆخانە؛ گراوخانە؛ جێیەک کە گرتوانی تێدا بۆ ماوەیەک ڕادەگرن.

**بازداشتن** / bāzdāštan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* ١. بەرگرتن؛ بەرپێگرتن؛ وەرگێرتەی؛ بەرگیری کردن لە کاری کەسێک؛ بەرهەڵست بوون ٢. *[نامتداول]* گرتن؛ گرتنەوە؛ گلەودایەن؛ گلەودان؛ گێرتەی؛ دەست بە سەردا ڕاگرتن. هەروەها: **بازداشتنی**

■ صفت فاعلی: **بازدارنده** (بەرگیر)/ صفت مفعولی: **بازداشته** (بەرگیراو)/ مصدر منفی: **بازنَداشتن** (بەرنەگرتن)

**بازداشتی** / bāzdāštî، ـها/: *اسم.* گیراو؛ گیراوە؛ گیریاگ؛ گرۆ؛ باڵبەس‌کراو.

**بازدم** / bāzdam، ـها/: *اسم.* هەناسەدانەوە؛ کار یا ڕەوتی دانەوەی هەناسەی هەڵکێشراو بۆ دەرەوە.

**بازده** / bāzdeh/: *اسم.* لێهات: ١. بەرهەمێک کە مرۆ، ماشین، کارخانە، کانگا یان پیشەیەک لە کاتێکی دیاریکراودا پێکی دێنێ یان دەتوانێ پێکی بێنێ ٢. توان یا هێزێک کە ماشین یا پیلێک بەرهەمی دێنێ. هەروەها: **بازده‌داشتن**

▣ **بازده سرمایه:** لێهاتی دەسمایە؛ دەسکەوت لە چاو خەرج؛ وەدەی سەرمایە.

**بازده‌کار:** لێهاتی کار؛ وەدەی کار؛ بەرهەم لەچاو کار.

**بازدید** / bāzdîd، ـها/: *اسم.* وەبینی؛ قەبینی؛ کار و ڕەوتی سەردان؛ چاو پێکەوتن؛ چاو پێکەوتنەوە: ١. چاو پێکەوتنی دووبارە؛ چەم پنەکەوتەی؛ دیمانەی دووجاران بۆ وەرامدانەوەی دیداری پێشووی کەسێک ‹به بازدید کسی رفتن: چوونە سەردانی کەسێک› ٢. دیتنی جێگایەک یان شتێک، زۆرتر بۆ زانیاری پەیدا کردن لە بار و دۆخی ئەو شتە. هەروەها: **بازدید شدن؛ بازدید کردن**

▣ **به بازدید کسی رفتن:** سەر لە کەسێک لێدان؛ چوونە دیتنی کەسێکەوە.

**بازدیدن** / bāzdîdan/: *مصدر.* دیتنەوە؛ چاو پێکەوتنەوە؛ ئەوەدیەی.

**بازرس** / bāzres، ـها؛ ـان/: *اسم.* بازڕەس؛ سەرکەشیکەر: ١. کەسێک کە لە لایەن دامەزراوە یان بەرپرسێکەوە ئەرکداری پێ‌ڕاگەیشتن بە چۆناوچۆنی گەڕانی کارەکانە ٢. کەسێک کە ئەرکی پێ‌ڕاگەیشتن لە چۆنیەتی ڕووداوێکی دیاریکراوی پێ سپێردراوە.

**بازرسی** / bāzresî، ـها/: *اسم.* ١. کار و ڕەوتی ڕاگەیشتن بە چۆناوچۆنی کار و بار

لە دامەزراوە یان ناوچەیێکدا ٢. ڕاگەیشتن بە چۆناوچۆنی ڕووداوێک ٣. کار یان ڕەوتی پشکنین؛ وشکان؛ وشکنەی؛ سەنگ و سۆزن‌کردنی جێگە یان کەل‌پەلی کەسێک ‹بازرسی منزل: پشکنینی خانوو› ٤. کار یان ڕەوتی دیتن؛ سەرنجدانی شتێک بۆ دڵنیایی لە دروست بوونی ‹بازرسی بلیت مسافران: دیتنی پسوولەی مسافران›.

**بازرگان** / bāzargān، ـها؛ ـان/: اسم. بازرگان؛ بازاڕوان؛ سەوداگەر؛ مامەڵەچی؛ ماڵ‌فرۆش؛ کووتاڵ‌فرۆش؛ تاجر.

**بازرگانی** / bāzargānî/: اسم. بازرگانی؛ بازاڕوانی؛ داوستەد؛ ئاڵش و وێرش؛ دان‌وسان: ١. کار یان ڕەوتی کڕین و فرۆشتن یا ناردن و هاوردنی کاڵای کەڵان بۆ قازانج ٢. بنکەی بازرگانی؛ بنکەیەک کە تێیدا سەوداگەری بکرێ.

▣ **بازرگانی آزاد**: بازرگانی ئازاد؛ باوەڕێکی ئابووری کە تێیدا فرۆش و بەشینەوەی کاڵا لە لایەن کەسان یا شەریکەگەلی سەربەخۆوە جێبەجێ دەکرێ: **تجارت آزاد**

**بازرگانی پایاپای**: ڕشت؛ ماڵ گۆڕینەوە؛ سەودای ماڵ‌بەماڵ؛ فرۆشتنی کاڵا و گرتنی کاڵاییکی‌تر لە جێی نرخەکەی: **بازرگانی تهاتُری**

**بازرگانی تهاتُری** ☜ **بازرگانی پایاپای**

**بازرگانی خارجی**: سەوداگەری دەرەکی؛ دان و ستانی شتومەک و باروبنە و پێداویستیگەلی گەل و هەروەها جێبەجێ کردنی پارە لە نێوان وڵاتێک لە گەڵ وڵاتانی‌تردا.

**بازرگانی داخلی**: سەوداگەری ناوخۆیی؛ دان و ستاندنی کاڵا و گۆڕینەوەی پارە و پیتەوا لە ناو وڵاتێکدا.

**بازرگانی دولتی**: بازرگانی دەوڵەتی؛ چەشنێک سەوداگەری کە ئەرکی جێبەجێ‌کردنی بە دەوڵەتە.

**بازره** / bāzra/: [کردی] اسم. بازرە؛ باژێڵە؛ باژەڵە؛ نەخۆشی زیپکەدانی دەست و پێی منداڵان.

**بازسازی** / bāzsāzî، ـها/: اسم. کار یان ڕەوتی دروست‌کردنەوە؛ وەشەوەکەردەی؛ وەش‌کەردەیوە؛ دووبارە درووس‌کردنەوەی شتێک کە خراپ بووە یان لە بەین چووە. هەروەها: **بازسازی شدن؛ بازسازی کردن**

**بازسان** / bāzsān، ـها؛ ـان/: صفت. بازئاسا؛ بازسان؛ وەکوو پەلەوەری باز.

**بازستاندن** / bāzsetāndan/: مصدر. متعدی. [ادبی] ئەستاندنەوە؛ ستاندنەوە؛ سەندنەوە؛ گرتنەوە؛ وەرگرتنەوە؛ ئەسایوە؛ سانایوە؛ ئەوەئەسەی؛ ئەوەسانەی؛ ژێ ستاندن: **بازستَدَن**. هەروەها: **بازستاندنی**

■ مصدر منفی: **بازنَستاندن** (نەسەندنەوە)

**بازستدن** / bāzsetadan/ ☜ **بازستاندن**

**بازشناختن** / bāzšenāxtan/: مصدر. متعدی. ناسینەوە؛ ڤەناسین؛ ئەوەژناسەی؛ ژناسایوە؛ دیسان ناسینی کەسێ یان شتێک.

**بازشناسی** / bāzšenāsî/: اسم. کار یان ڕەوتی ناسینەوە؛ وەناسین؛ ئەوەژناسەی؛ ڤەناسین؛ ناسینەوەی ئەوەی زووتر ناسراو بوو.

**بازکاویدن** / bāzkāvîdan/: مصدر. متعدی. دیسان لێکۆڵینەوە؛ هلکەوشاندنەڤە؛ هلکەواشتنەڤە.

**بازکشیدن** / bāzkešîdan/: مصدر. متعدی. کێشاندنەوە؛ ئەوەکێشەی؛ دیسانەوەکێشان.

**بازگرداندن** / bāzgardāndan/: مصدر. متعدی. [ادبی] گێڕاندنەوە؛ گەڕاندنەوە؛ گێڕاننەوە: ١. هاوردنەوە؛ بەردەیوە؛

ئەوبەردەی؛ بۆ جێی پێشوو هێنانەوە ٢. هەڵگەڕاندنەوە؛ ئەوەگێڵنەی؛ گێڵنایوە؛ بە زۆر گەڕاندنەوە. هەروەها: **بازگرداندنی**

■ مصدر منفی: **بازنَگرداندن** (نەگێڕاندنەوە)

**بازگردیدن** / bāzgardîdan/ ☜ **بازگشتن**

**بازگرفتن** / bāzgereftan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* ئەستاندنەوە؛ هەستاندنەوە؛ سەندنەوە؛ گرتنەوە؛ وەرگرتنەوە؛ وەگرتنەوە؛ ئەسایوە؛ ئەوەئەسەی؛ گێرتەیوە؛ ئەوەگێرتەی؛ شتی دراو ساندنەوە. بەرانبەر: **باز دادن**. هەروەها: **بازگرفتنی**

■ مصدر منفی: **بازنَگرفتن** (نەگرتنەوە)

**بازگشت** / bāzgašt، ـها/: *اسم.* ڤەگەڕ؛ ئەواگل؛ ئەواگێڵ؛ واگل؛ نكس؛ هەو؛ كار یان ڕەوتی وەگەڕان؛ وەرگەڕان؛ زڤڕین؛ ڤەزڤڕان؛ ڤەزفریان؛ هەڵگەڕانەوە؛ گەڕانەوە.

**بازگشتن** / bāzgaštan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* ١. گەڕانەوە؛ گەڕیانەوە؛ هەڵگەڕانەوە؛ هەڵگەڕیانەوە؛ ڤەگەڕیان؛ زڤڕینەوە؛ وەگەڕان؛ هەوكردن؛ هاتنەوە؛ گێلایوە؛ ئەوەگێلەی؛ هۆرەوەگێلەی؛ ئامایوە؛ ئەوەئامەی؛ هاتنەوە بۆ شوێنی پێشوو ٢. كرانەوە؛ ئاوەلا بوون * **بازگردیدن** هەروەها: **بازگشتنی**

■ مصدر منفی: **بازنَگشتن** (هەڵنەگەڕانەوە)

**بازگشتی** / bāzgaštî، ـها/: *صفت.* هەڵگەڕاوە؛ گەڕیاوە؛ گەڕاوە؛ هۆرگێلیا؛ ئەوەگێلیا ‹پولهای بازگشتی در حساب ویژەای نگهداری میشوند: پارە هەڵگەڕاوەكان لە حەسابێكی تایبەتیدا چاوەدێری دەكرێن›.

**بازگشودن** / bāzgošûdan/: *مصدر. متعدی.* دیسانەوە كردنەوە؛ ئەوەكەردەی؛ دیسان ئاوەلاكردن.

**بازگفتن** / bāzgoftan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* گەڕاندنەوە؛ گێڕانەوە؛ دووبارە گوتنەوە؛ وتنەوە؛ واتەیوە؛ ئەوەواتەی؛ وتنەوەی ئەوەی كە زووتر گوتراوە یان بیسراوە ‹آنچه را كە شنیدە بود بتمامی بازگفت: ئەوەی كە بیستبووی بە تێر و تەسەلی گوتیەوە›. هەروەها: **بازگفتنی**

■ مصدر منفی: **بازنَگفتن** (نەوتنەوە)

**بازگو** / bāzgû/: *اسم.* واوێژ؛ وازگۆ؛ واگۆ؛ وەگۆ؛ ئەوەواچ؛ كار یان ڕەوتی وازگۆكردن.

▣ **بازگو كردن**: گێڕانەوە؛ گێڕاننەوە؛ گێڕاندنەوە؛ گەڕاندنەوە؛ ڤەهاندان؛ واتەیوە؛ ئەوەواتەی؛ دووبارە گوتنەوە. هەروەها: **بازگو شدن**

**بازگویی** / bāzgûyî، ـها/: *اسم.* ڕەوتی وتنەوە؛ گوتنەوە؛ واگۆیی؛ وەگۆیی ‹از بازگویی حرفهای او معذورم: لە گوتنەوەی قسەكانی ئەو داوای لێبووردن دەكەم› (یانێ ناتوانم دووپاتەی بكەمەوە).

**بازماندگان** / bāzmāndegān/: *اسم.* پاشماوان؛ لێبەجێماوان؛ ئەوەمەنێ؛ ژن/شوو، منداڵ و خزمانی زیندووی كەسی مردوو.

**بازماندن** / bāzmāndan/: *مصدر. لازم. [نامتداول]* مانەوە؛ ڤەمان؛ وەمان؛ ئەوەمەنەی: ١. نەبزوون؛ لە جێی خۆ مانەوە؛ مەنایوە؛ وەستان ٢. دامان؛ سەر نەكەوتن لە كاردا ‹مریض شدم و از كار بازماندم: نەخۆش كەوتم و لە كار مامەوە›. هەروەها: **بازماندنی**

■ مصدر منفی: **بازنَماندن** (نەمانەوە)

**بازنپرسیدن** / bāznaporsîdan/ ☜ **بازپرسیدن**

**بازنتابیدن** / bāznatābîdan/ ☜ **بازتابیدن**

**بازنداشتن** / bāznadāštan/ ☜ **بازداشتن**

**بازنده** / bāzande، ـها؛ ـگان/: *صفت.* ١. چویز؛ خیچاو؛ داناو؛ دۆڕاو ٢. بەزاو؛ بەزیا؛ بەزیاگ؛ بەزیاو؛ بەزراو؛ شكست خواردوو.

**بازنستاندن** / bāznasetāndan/ ☜ **بازستاندن**

**بازنشست** / bāznešast، ـها/: *اسم. [گفتاری]*

وەنیشتە؛ کارکەنار؛ خانەنشین؛ لەکارتە.

**بازنشستگی** / bāznešastegî/: *اسم.* وە نیشتە یی: ١. بار و دۆخ یان چۆنیەتی درێژە نەدان بە کارێک: *الف)* بە پێی قانوون و بە وەرگرتنی ماف و مز بۆ پاشماوەی تەمەن *ب)* ڕاسپاردنی کاری خۆ بە کەسێکی‌تر ٢. مووچەی وەنیشتە بەپێی قانوون.

**بازنشسته** / bāznešaste، ـها؛ ـگان/: *صفت.* وەنیشتە؛ خانەنشین؛ کارکەنار؛ لەکارتە؛ نیشتەبەر. هەروەها: **بازنشسته بودن؛ بازنشسته شدن؛ بازنشسته کردن**

**بازنگردانــدن** / bāznagardāndan/ ☜ **بازگرداندن**

**بازنگرفتن** / bāznagereftan/ ☜ **بازگرفتن**

**بازنگری** / bāznegarî، ـها/: *اسم.* کار و ڕەوتی پێداچوونەوە؛ پێداڕوانینەوە؛ بینینەوە؛ ئەوەوینەی؛ سەرنجدانەوەی دەق، گەلالە یان بۆچوونێک بۆ گۆڕان یان تەواوکردن یا ساغ کردنەوەی ‹بازنگری برنامەهای اساسی: پێداچوونەوەی بەرنامەگەلی بنەمایی›.

**بازنگریستن** / bāznegarîstan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* وەڕوانین: ١. ڕوانینەوە؛ بینینەوە؛ ڤەمەیزین؛ویناوە؛ ئەوەوینەی ٢. بەرەو دوا ڕوانین؛ بۆ دوا ڕوانین. هەروەها: **بازنگریستنی**

**بازنگشتن** / bāznagaštan/ ☜ **بازگشتن**

**بازنگفتن** / bāznagoftan/ ☜ **بازگفتن**

**بازنماندن** / bāznamāndan/ ☜ **بازماندن**

**بازنمایی** / bāznemāyî/: *اسم.* نواندنەوە؛ نیشاندانەوە؛ پیشاندانەوە؛ کار یان ڕەوتی خستنە ڕوو یان نیشاندانی دووبارە.

**بازنمودن** / bāznemûdan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* ١. بازکردن؛ کردنەوە؛ ئاوەلاکردن؛ والاکردن؛ کەردەیوە؛ ئەوەکەردەی؛ واز کەردەی ٢. نواندن؛ نیشاندان؛ ئرمانەی. هەروەها: **بازنمودنی**

**بازنیافتن** / bāznayāftan/ ☜ **بازیافتن**

**بازنیامدن** / bāznayāmadan/ ☜ **بازآمدن**

**بازنیاوردن** / bāznayāvardan/ ☜ **بازآوردن**

**بازو** / bāzû، ـها؛ ـان/: *اسم.* ١. باسک؛ بازوو؛ باهۆ؛ ساکول؛ قۆڵ؛ چەپل؛ بەوش؛ زەند؛ بازووک؛ پەل؛ مل؛ لە سەری پەنجەوە تا شان؛ نێوان ئانیشکا و شان ٢. *[مجازی]* دەست؛ دەس ‹بازوی توانا: دەستی بەهێز› ٣. *[مجازی]* یاریدەر؛ یاوەر ‹او در حُکمِ بازوی من است: ئەو یاریدەری منە› ٤. دەسە؛ دەسک؛ دەسگ؛ دەستە و باسکی بڕێ شت ‹بازوی اهرُم: دەستەی نوێڵ›.

◙ **بازوی اهرم:** *[فیزیک]* دەستەی نوێڵ؛ باسکی لۆسە؛ باهۆی مەلغە؛ میلەیەکی بەرز و قایمە کە لە جێگایێکیەوە پاڵ دەدا بە پالگەوە و بۆ هەڵتەکاندن و هەڵبڕینی شتگەلی قورس بە کاری دەبەن.

**بازوی محرک:** *[فیزیک]* باسکی جووڵێنەر؛ مەودای هێزی بزوێنەر تا پالگە.

**بازوی مقاوم:** باسکی باشاری و بەرگری؛ مەودای هێزی بەرگریکەر تا پالگە.

◙ **بازو به بازو دادن:** *[کنایی]* دەس لە دەس نان؛ دەستگرتن؛ دەس دانە ژێر باڵ؛ دەستگرتنە ژێرباڵی یەکێکەوە: **بازو در بازو افکندن**

**بازو در بازو افکندن** ☜ **بازو به بازو دادن**

**بازوگشادن:** *[کنایی]* ١. دەس بە کار بوون ٢. تەیار بوون.

**بازوی چیزی داشتن:** *[کنایی]* دەس ڕۆیشتن؛ دەس لەبار بوون؛ بەدەست بوون؛ خاوەن برشت و توان بوون لە شتێکدا.

**بازوئی** / bāzû'î/ ☜ **بازویی**

**بازوبند** / bāzûband، ـھا/: اسم. بازیوەن؛ بازووبەند؛ بازیبەند؛ بازبەند؛ بازووبەن؛ قۆڵبەند؛ قۆڵبەن: ١. قۆڵەوانە؛ زەنبەری باسک؛ حەمایەلی بە مت‌ومۆرەوە کە لە سەرووی ئانیشک دەبەسرێ ٢. نەوارێک کە بە نیشانەی ئازیەتی، هەبوونی کاری تایبەتی یان ئەندامەتی لە جێیەک دەیبەستنە قۆڵەوە ٣. چاوەزار؛ نزا، گازە و نووشتەیەک کە بە باسکەوە دەیبەستن ٤. جۆرێ زرێی باسک.

**بازوکا** / bāzûkā، ـھا/: [انگلیسی/ فرانسوی] *اسم. [نظامی]* بازووکا؛ جۆرە گولەهاوێژێکی دژ دەبابەیە.

**بازویی** / bāzûyî/: *صفت.* قۆڵی؛ باسکین؛ پێوەندیدار یان سەر بە باسکەوە ‹اعصاب بازویی: دەماری باسکین›: **بازوئی**

**بازه** / bāze/: *اسم.* ١. گەلی؛ دۆڵ (بەتایبەت دۆڵی هەراو) ٢. مەودای نێوان دوو دەستی باز.

**بازی** / bāzî، ـھا/: *اسم.* بازی؛ وازی: ١. گەمە؛ گاڵتە؛ گۆنگڵ؛ کایە؛ لاری؛ لیستەک؛ کەی؛ یاری؛ گەم؛ گەپ؛ کەیلێ؛ تێکۆشان و خۆ خەریک‌کردن بە لەش یان بە هەش بۆ سەرگەرمی و خۆشی و ڕابواردن ٢. چالاکی وەرزشی ٣. قمار؛ قومار ٤. دەور گەڕاندن لە شانۆ یان فیلمێکدا ٥. *[مکانیک]* بزووتنەوە و لەرزینەوەی پاژێکی دەزگایەک لە جێی خۆیدا ٦. *[مجازی]* گاڵتە؛ تەشقەڵە؛ گەمە؛ کاری بێ‌هۆ؛ هەڵە ٧. *[مجازی]* کاری گۆترە و خۆ خلافێن ٨. *[مجازی]* فریو؛ گزی؛ تەڵەکە ٩. ئاوەڵایی؛ والایی.

▣ **بازی شاه‌بالله:** *[کنایی]* ناتەبایی و دووچاوەکی (بەتایبەت لە نێوان دوو کەسدا).

▣ **بازی خوردن:** *[کنایی]* بوونە گۆنگڵ؛ فریو خواردن؛ کایەکلێ بوون؛ بوونە گەپچار؛ گۆنگڵ پێکران ‹این همه سال بازی خوردیم: ئەم هەمکە ساڵە بووینە گونگڵ›.

**بازی دادن:** بازی دان: ١. لە گەڵ کەسێکدا گەمەکردن؛ کەسێک سەرگەرم کردن ٢. فریودان؛ خاپاندن ‹شریکش را بازی داد: هاوبەشەکەی فریو دا›.

**بازی درآوردن:** ١. پیشاندان؛ نمایشت دان؛ ڕۆنان ٢. ڕمڵ‌کاری‌کردن؛ تیتاڵی کردن؛ خۆ بە درۆ بەستنەوە.

**بازی کردن:** ١. لەیزتن؛ لەیزین؛ لەیستن؛ لەهیستین؛ لیزتن؛ کایەکردن؛ گەمە کردن؛ کەیلێ‌کەردەی؛ هەڵتیقان؛ وازی کردن؛ یاری‌کردن؛ هەڵبەزین بۆ بازی کردن ٢. دەوردیستن؛ دەورگێڕان؛ دەورگەڕاندن ‹او در چند فیلم بازی کرده است: لە چەند فیلمدا دەوری گەڕاندووە›.

**بازیار** / bāzyār، ـھا/: *اسم. [نامتداول]* بازیار: ١. وەرزێر؛ وەرزیەر؛ وەرزەوان؛ فەلا؛ کەشاوەرز؛ کێڵیار؛ جووتیار؛ هیت‌یار ٢. بازدار؛ بازەوان؛ کەسێ کە پیشەی پاراستن و پەروەراندنی مەلانی ڕاوکەرە.

**بازیافت** / bāzyāft، ـھا/: *اسم.* وەدۆزی: ١. کار یان ڕەوتی هێنانەوە؛ دۆزانەوە؛ دۆزینەوە؛ یۆسەیوە؛ ئەوە یۆسەی؛ بە دەست هێنانەوەی ئەوەی کە ون بووە ٢. کار یان ڕەوتی بەرهەم هێنانەوە؛ بەکەڵک کردنەوەی شتێک کە پێشتر کەڵکی لێ‌وەرگیراوە یان تووڕدراوە ‹بازیافت زبالە: دۆزینەوەی زبڵ› ٣. بەرهەم هێنان؛ کار یان ڕەوتی بە دەست هێنانی دوا بەرهەمی کار و تێکۆشانێکی بەزانست. هەروەها: **بازیافت شدن؛ بازیافت کردن**

**بازیافتن** / bāzyāftan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* وەدۆزین: ١. دۆزینەوە؛ دیتنەوە؛ دینەوە؛

وەدیــتن؛ قــەدیــن؛ بــە ســەرگرتنەوە؛ بــە سەرگرتن؛ پەیدا کــردن؛ دیــەیــوە؛ ئــەوەدیــەی؛ یۆســەیــوە؛ ئــەوەیۆســەی؛ دۆزینــەوەی گــوم بووگ ۲. شــتێک بــەدەســت هێنانــەوە لــەوەی کە بۆ جارێک بــەهــرەی لــێ وەرگــیراوە و فــڕێ دراوە. هەروەها: **بازیافتنی**

■ مصدر منفی: **بازنَیافتن** (نەدۆزینەوە)

**بازیافتــــــــه** / bāzyāfte/: صـــــفت. دۆزراوە؛ دۆزیاوە؛ دۆزیاگەوە؛ ئەوە یۆزیا؛ وەدۆزراو.

**بازیــافتی** / bāzyāftî، ـهــا/: صـفت. [گفتـاری] دۆزراوی؛ دیتراوی؛ ئەوە یۆزیا.

**بازیچــــه** / bāzîče، ـهــا/:اســم. ۱. بازیچــە؛ لــەیــستۆک؛ ئــامرازی یــاری و گــەمــە ۲. [مجـازی] دارەدەســت؛ داردەســت؛ ئــەوەی کــە دەبێتــە ئــامرازی دەســتی دیتــران (زیــاتر بــۆ کــاری نــەگونجــاو) و بــە شــێوەیــەک کــە لــە خۆیــەوە لێهاتوویــەکــی نــەبــێ ‹از ســادگی بازیچــەی دیگــران شــده بــود: لەبــەر ســاویلکەیی ببووە داردەستی ئەم و ئەو›.

**بــازی‌خــورده** / bāzîxorde، ـها؛ ـگان/: صفت. فریوخــواردوو؛ خــەڵــەتــاو؛ هــەڵخــڵەتــاو؛ خڵەتیاگ؛ خەڵەتیاو؛ بە سەرچوو؛ هەربلیو.

**بــازی‌درمــانی** / bāzîdarmānî، ـهــا/:اسم. بازی‌دەرمــانی؛ وازی‌دەرمــانی؛ کــار یــان ڕەوتی چارەکردنی نــەخۆشــیگەلی ڕەوانی بــە کــەڵــک وەرگــرتن لــە کایــەگــەل و بــەشــدارکردنی نەخۆش لەو گەمەیانەدا.

**بــازیکن** / bāzîkon، ـهـا؛ ـان/:اسم. بازیکــەر؛ وازیکــەر؛ یاریکــەر؛ گــەمــەکــەر؛ کایــەکــەر؛ کــەیاکــەر: ۱. کــەســێک کــە لــە کایــەدا بەشداری دەکا ۲. ئــەو کــەســە کــە لــە کایــەدا کارامەیە.

**بــازیگر** / bāzîgar، ـهـا؛ ـان/:اسم. وەینــەک؛ نوێن‌بــاز؛ بازیگێــڕ؛ کایــەگێــڕ: ۱. هونــەرپیــشە؛ هونــەرکــار ۲. [مجـازی] مــەرایــی‌کــار؛ ڕیاکــار؛ دووڕوو؛ کەسێ کە بە درۆ و تــەڵــەکــە خــەڵــک فریو دەدا.

**بازیگری** / bāzîgarî، ـهـا/:اسم. ۱. شــانۆگێڕی؛ نوێنبــازی ۲. [مجـازی] ڕووپامــایی؛ ڕیاکــاری؛ دووڕوویــی؛ ڕواڵــەتچــی و چاپکــەیــی بــوون بــۆ خاپاندنی خەڵک.

**بـــازیگوش** / bāzîgûš، ـهـــا/: صـفت. هــار و لاســار؛ زلــق؛ هاروهــاج؛ ســەرهــار؛ تڕانــەکــەر؛ بزۆز؛ جرپۆ؛ جــرپن؛ دانەســەکاو؛ دانــەســەکناو؛ هــەدانــەدەر؛ ئۆقرەنــەگرتــوو: ۱. شــۆخی‌بــاز؛ حــەنــەکچــی ۲. گــۆترەکــار ۳. بارنــەبــەر؛ بارنەوەر؛ بەد؛ چوارپێی تووش و قوشقی.

**بازیگوشــی** / bāzîgûšî، ـهــا/:اسم. جــرت و فرتی؛ جرپوجــۆپی؛ جــەربــەزەیــی؛ هاروهــاجی: ۱. شــۆخی‌بــازی؛ گــۆنگلی؛ گــەمــە و شــۆخی کــردنی زۆر ۲. خــۆ و خــدەی گــۆتره بــۆ خــۆ خافڵاندن.

**بازیلیــــسک** / bāzîlîsk، ـهــا/:اسم. جــۆری بزنــەمــار(ســووسمار)ی ناوچــەی گــەرمیــانی ئامریکا کە دەتوانێ بە سەر ئاودا بڕوا.

**بازیلیــــک** / bāzîlîk/: [معــرب از یونــانی] ☜ **باسِلیق**

**بــاژ** / bāj/:اســم. ۱. قــولانج؛ گوێــل؛ قــۆلاج؛ قــول؛ مــەودای نێــوان قامکــە گــەورە و قــامکی شادە ۲. [قدیمی] باژ؛ باج؛ پیتاک؛ خویک.

**باژگون** / bājgûn/ ☜ **واژگون**

**بـــــاس** / bās/: [فرانــسوی از ایتالیــایی] اســـم. [موســیقی] گــڕ؛ گرانــە؛ گرمــە: ۱. گــڕترین دەنگــی پیــاو ۲. گــڕترین بــەشــی دەنــگ لــە پارچــەیــەکــی مۆســیقادا ۳. بــەگرمــەتــرین و گەورەترین سازی ژێدار لە ئۆرکیستردا.

**باســتان** / bāstān/: صفت. کــەونــارا؛ کــەونینــە؛ باستان؛ کۆن؛ کەڤــن؛ دێــرین؛ لــە مێژینــە؛ زۆر قەدیمی ‹ایران باستان: ئێرانی کەونارا›.

**باســتان‌شــناس** / bāstānšenās، ـها؛ ـان/:اسم.

کەونینەناس؛ دێرینەناس؛ باستان‌شوناس؛ خوێنەوار و ئاگادار لە دێرینەناسیدا؛ زانای ئاسەواری کۆن.

**باستان‌شناسی** / bāstānšenāsî/: *اسم.* کەوناراناسی؛ کەڤن‌ناسی؛ ئاگاداری لە ڕۆژگاری کۆن و زۆر پێشوو.

**باستانی** / bāstānî/: *صفت.* مێژوویی؛ کەونارایی؛ کۆنینە؛ کەونینە؛ کۆن؛ قۆجە؛ زۆر لە مێژینە؛ پێشوونە؛ کەڤناری؛ دێرینە؛ دێرسی؛ دێریک ‹اثر باستانی: ئاسەواری کەونارایی›.

**باستانی‌کار** / bāstānîkār، ـها؛ ـان/: *اسم.* باستانی‌کار؛ وەرزشکاری زۆرخانە؛ وەرزشکاری وەرزشی مێژوویی زۆرخانە.

**باسترک** / bāstarak/: [؟] ☜ **توکا**

**باستیون** / bāstîyon، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* *[نظامی]* ئاسێگە؛ ئەسلەخانە؛ جبەخانە؛ برج؛ کەلهە؛ قەلای هەمارکردنی چەک و ئامرازگەلی شەڕ.

**باسک** / bāsk/: *اسم.* باسک: ۱. خێلی دانیشتووی وڵاتی باسک لە باکووری سپانیادا ۲. /ـها/ هەرکام لە کەسانی ئەو خێلە ۳. زمانی ئەو خێلە کە پێوەندی لە گەڵ زمانەکانی‌تردا نەناسراوە.

**باسکول** / bāskûl، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* قەپان؛ قاپان؛ باسکۆ؛ تەرازووی زل.

**باسلق** / bāsloq/: [ترکی] *اسم.* باستیک؛ باسووق؛ باسووخ؛ باسووز؛ تەمسق؛ بەنی؛ سجۆق؛ سنجۆق؛ خواردنێکی شیرینە لە نیشاستە و شیرە و شەکەر دەکرێ.

**باسلیق** / bāselîq/: [معرب از یونانی] *اسم.* *[کالبدشناسی]* ڕەشەڕەگەی نێو باسک؛ ڕەگێ ڕەش قەڕاخی ناوەوەی باڵ: **بازیلیک**

**باسمه** / bāsme، ـها/: [ترکی] *اسم.* *[قدیمی]* ۱. چاپ ۲. چاپ بە مۆر لە سەر پارچە ۳. مۆر.

**باسمه‌ای** / bāsme'î/: [ترکی] *صفت.* *[قدیمی]* ۱. چاپی ۲. *[کنایی]* بێ‌بایەخ؛ دەغەڵ؛ چرووک؛ بێ‌نرخ.

**باسمه‌کاری** / bāsmekārî، ـها/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* جۆرێ چاپی بە مور لە سەر پارچە و...

**باسن** / bāsan، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* سمت؛ سورین؛ سمقۆڵ؛ تەتی؛ هێت؛ تەتک؛ لاڕان؛ هێفەل؛ گرمگە؛ دوپنە؛ تیەتگ؛ کوماخ؛ قوڕک؛ لاقنگ؛ لاقوون؛ ئەستوورایی بەر کەمەر.

**باسواد** / bāsavād/: [فارسی/ عربی] *صفت.* خۆندکار؛ خوێندەوار؛ خۆندەوار؛ خوەنەوار؛ خوێنەوار؛ خۆندەوان؛ خوێندەڤان؛ خۆندەڤان؛ خوێندە؛ خۆندی؛ وەندۆخ؛ باسەواد؛ وانا؛ وانیار؛ هێن‌سوویی؛ خاوەن توانایی خوێندنەوە و نووسین.

**باشقیر** / bāšqîr/: *اسم.* باشقیر: ۱. خێلی دانیشتووی ئاسیای ناوەندی کە پێست سپی و ترک زمانن ۲. /ـها؛ ـان/ هەرکام لەو خێلە ۳. زمانی ئەو خەڵکە کە یەکێ لە زمانگەلی سەر بە تورکیە.

**باشگاه** / bāšgāh، ـها/: *اسم.* یانە؛ یانی؛ گازتین؛ گاستین؛ جێگەی سانەوە ‹باشگاه ورزشی؛ باشگاه علمی: یانەی وەرزشی؛ یانەی زانستی›.

**باشلق** / bāšloq، ـها/: [ترکی] *اسم.* باشلوق؛ جۆرێ کڵاوی بە کراسەوە لکاو.

**باشه** / bāše/ ☜ **قرقی**

**ـ باشی** / bāšî، ـها؛ ـان/: *پیواژه.* ـباشی؛ سەر؛ سەرپەرشت؛ سەردەستە؛ سەرگەورە؛ سەرۆک ‹معمارباشی: بەناباشی› (ڕاڤە: زۆرتر بۆ ڕێز و بانگ‌کردن و ناو بردنی خاوەن پیشەگەلێک بەکاردێ).

**باصـــره** / bāsere/: [عربـــی]/اســـم. [ادبـــی] ۱. بینایی؛ سۆما ۲. چاو؛ چەهڤ؛ چەم؛ چەو.

**باطری** / bātrî/: [فرانسوی] ☜ **باتْری**

**باطـــل** / bātel/: [عربـــی] صـــفت. ۱. [ادبـــی] بێخۆ؛ هەڵـوەشاو؛ بێهـوودە؛ پووچـەڵ؛ قـویڵ؛ پڕ و پووچ ‹کار باطل: کـاری بـێ‌خـو› ۲. نـاڕەوا؛ ناڕاست؛ نادروست.

◘ **باطـل** شـدن: لـە بایـەخ‌کـەوتـن؛ پووچـەڵ بوونەوە. هەروەها: **باطل کردن**

**باطلاق** / bātlāq/: [ترکی] ☜ **باتْلاق**

**باطلاقی** / bātlāqî/: [ترکی] ☜ **باتْلاقی**

**باطله** / bātele، ـها/: [عربی] صفت. بـەتـاڵ‌کـراو؛ بەتاڵەوەبووگ؛ لاکەوتە؛ نەکاربـا؛ پووچـەڵ‌کـراو؛ دەورنەماو.

**بـــاطن** / bāten/: [عربـــی]/اســـم. نـــاوەرۆک: ۱. نـاخ؛ نـاو؛ کـاکڵ؛ هـەنـاو؛ نـاواخن؛ دەروون؛ هـەنـدەروون ۲. ـهـا/[مجـازی] هـۆش؛ هـوز؛ بیر؛ زەین؛ ڕاناو.

**باطنـاً** / bātenan/: [عربـی] قیـد. ۱. لـە نـاوەوە؛ لە دڵـەوە؛ دڵـەنـە؛ لـە دەروونـەوە؛ لـە ناخـەوە ۲. بەڕاستی؛ لەڕاستیدا.

**بـــاطنی** / bātenî/: [عربـــی] صـــفت. دەروونی؛ ناوەکی: ۱. پێـوەندیـدار یـان سـەر بـە ناخـەوە ‹عقیدەی باطنی: بـڕوای دەروونی› ۲. پێـوەندیـدار یان سەر بە هەرکام لـەو دیـن و ئامۆژانـەی کـە تەنیا پەیڕەوەکانیان بۆیان هەیە ئاگاداریيان لێوە هـەبـێ و بـزانن چییـە و چۆنـە ۳. ـهـا؛ ـان/ پەیڕەوی ئاوەها دین و ئامۆژەگەلێک ٤. [قـدیمی] ئیسماعیلی.

**باطنیـــه** / bātenîyye/: [عربـــی]/اســـم. باتینییـــە؛ نـــاتۆرەیێـــک کـــە نـــەیـــارانی ئیـــسماعیلیان دابوویان لێیان.

**باطیس** / bātîs/: [از فرانسوی] ☜ **باتیس**

**باعـــث** / bā'es/: [عربـــی]/اســـم. هـــۆ؛ هۆکـــار؛ ســـۆنگە؛ هۆکـــار یـــان هـــۆی کارێـــک، دیاردەیێک یـان ڕووداوێـک ‹باعث باران: هـۆی باران›. هەروەها: **باعـث بـودن؛ باعـث گردیـدن؛ باعث گشتن**

**باعـث‌وبـانی** / bā'es-o-bānî/: [عربـی]/اسـم. ۱. [گفتاری] هـۆ؛ هـۆ و هۆکـار ‹او باعث و بانی این کار شد: ئەو بـوو بـە هـوی ئـەم کـارە› ۲. [مجـازی] بنـــار؛ یانـــەوان؛ خـــاوەن؛ خێـــو؛ ســـاحێو؛ سەرپشت ‹مگر این بچەها باعث و بانی ندارند؟: مەگەر ئەم منالانە خاوەنیان نیە؟›.

**بـــاغ** / bāq، ـهـا؛ ـات/:اسـم. بـاخ؛ بـاغ: ۱. دارســـتانی میـــوە؛ بۆســـان؛ بێـــستان؛ بێـــسان؛ مـڵـک ۲. خانـەبـاغ؛ ماڵـی لـە نێـو حـەوشـی گەورەی پڕ لە گوڵ و گیادا.

◘ **بـاغ گـل**: گوڵـستان؛ باخـەگـوڵ؛ گوڵـجار؛ گوڵزار؛ گولزار؛ گوڵەک؛ مێرگی گوڵ.

**بـــاغ گیـــاه‌شناســـی**: بـــاخی ڕوەکناســـی؛ باخچـــەی خوێنـــدکاران بـــۆ لێکۆڵـــینەوەی ڕوەکناسی: **باغ نباتات**

**باغ ملّی**: باخی گشتی؛ پارک.

**باغ نباتات** ☜ **باغ گیاه‌شناسی**

**باغ وحش** ☜ **باغوحش**

**باغبـــان** / bāqbān، ـهـا؛ ـان/:اسـم. باخـــەوان؛ باغـــەوان؛ نـــاتۆر؛ نـــاهتۆر؛ ئـــەوەی ڕەز و داری میوە بە خێو دەکا.

**باغبـــانی** / bāqbānî/:اسـم. باخـــەوانی: ۱. کـــار یـــان ڕەوتی چانـــدن و هـــەراش‌کـــردنی گـــوڵ و میـــوە لـــە باخـــدا ۲. زانـــست و هونـــەری باخەوانی ۳. کاری باخەوان.

**باغچـــه** / bāqče، ـها/:اسـم. ۱. باخچـــە؛ باغچـــە؛ دێبـــەر؛ تالانـــە؛ تلانـــە؛ بوخچـــە؛ جـــان؛ جێـــی گـــوڵ و ســـەوزی چانـــدن لـــە حـــەوشـــەدا ۲. باغی چکۆلە؛ گوڵگەشت.

**باغـــدار** / bāqdār، ـــ ـهـا؛ ـان/:اسـم. باخـــدار؛ خاوەن باخ؛ ئەو کەسـەی کـاری پێڕاگـەیـشتن بە باخە.

**باغـــداری** / bāqdārî/: اسـم. باخـــداری: ۱. کاری دانـانی بـاخ ۲. زانـستی سـەبـارەت بـەو کارە.

**بـــاغراه** / bāqrāh، ـهـا/: اسـم. شــینکەڕێ؛ لێــــڕەوار؛ ڕێگـــای بـــە نـــاو شـــینکە و سەوزەڵانیدا: **پارک وی**

**باغــــستان** / bāqestān، ـهـا/: اسـم. باخـــەوار؛ باخـــستان؛ باخـــسان؛ شـــوێنی پـــڕ لـــە بـــاخ و بێستان.

**باغــشهر** / bāqšahr، ـهـا/: اسـم. خانـەباخـان؛ شاری نێو باخ و باخان.

**باغکـــاری** / bāqkārî/: اسـم. باخکـــاری؛ بـــاخ چـــێ‌کـــری؛ کـــار یـــان ڕەوتی بـــاخ نیـــان و پەروەردەکردن.

**بـــاغ‌وحـــش** / bāq(e)vahš، ـهـا/: [فارسـی/ عربـی]/اسـم. باخچـەی گیانـەوەران؛ ڕاورگـــە؛ باخـــدەی؛ دارســـتانی دەورەگـــیراوی تایبـــەت بۆ چـاوەدێـری گیانلـەبـەرانی دەشـت و کێـو و سەیرانی خەڵک.

**ـ باف** / bāf، ـها؛ ـان/: پیواژه. ــچـن: ۱. ــهـۆن؛ ـڤەهان؛ـمۆن؛ جـۆڵا؛ بووزووتـەن ‹مخمـل‌بـاف: مـەخمـەلـچن؛ مـەغمـەلـهۆن› ۲. [گفتـاری] ـڕاچن؛ ـ داچـن؛ هۆنـدراو ‹درشـت‌بـاف: درشـت هۆندراو›.

**بافالو** / bāfālû/: [انگلیسی] ☜ **بوفالو**

**بافـت** / bāft، ـهـا/: اسـم. کـر؛ تـەنـراو؛ بافـت؛ هۆنـــە؛ هۆنـدراو؛ وەن: ۱. کـەسـم؛ پێکهـات؛ ڕەت ۲. [زەمـین‌شناسـی] ئـەتـەم؛ ڕەج؛ ڕەگ؛ ڕەگـە؛ چۆنـاوچۆنی جـێگیر بـوونی کانگاگـەل ۳. [زیست‌شناسی] شانە؛ کۆمـەڵـەخانـەیـەک کـە لـە یـەکتـری دەچـن و پێکـەوە فرمانێـک جێبـەجـێ دەکـەن ‹بافـت استخوانی: شـانەی ئێـسکی› ٤. کـار یـــان ڕەوتی هۆندنــەوە؛ چنین.

▣ **بافـت استخوانی**: شـانەی ئێـسکی؛ جـۆرێ شـانەی ئێـسک‌سـاز کـە تێـدا فوسـفور و کالسیۆم زۆرە.

**بافت خونی**: شانەی خوێنی؛ خوێن.

**بافـت چربـی**: شـانەی چـەوری؛ دووگ؛ وەز؛ بەز؛ جۆرێ شانەی پڕ لە چەوراییی.

**بافــت غــضروفی**: شــانەی کرکراگـــەیـــی؛ کرۆژنە؛ کرۆچە؛ کرۆچـەنـە؛ چـین یـا مـاکی بەدیهێنەری کرکراگە.

**بـــافتن** / bāftan/: مـصدر. متعـدی. // **بـــافتی**: چنیـت؛ **مـی‌بـافی**: دەچـنی؛ **بِبـاف**: بچنـە// ۱. چـنین؛ چـەنـین؛ هـۆنین؛ هۆنـدن؛ هۆندنـەوە؛ هۆنینـــەوە؛ ڕاچانـــدن؛ چنیـــەی؛ ڤـــەهانـــدن؛ ڤـەهوونیـان؛ ڤـەهوونـان؛ هۆنـان؛ هۆندنـەوەی بـەن (لـە خـوری، پـەمـوو، هـەورێـشم و...) بـە دەســـت یـــان بـــە ماشـــێن ‹بـافتن پارچـە: هۆندنـــــەوەی قومــــاش› ۲. موونانـــــدن؛ پەلکەکردن؛ هۆنینـەوەی چـەپکـی مـوو ‹بافتن گیـسو: پـەلکـە کـردنی قـژ› ۳. [مجـازی] هـەڵـبەسـتن؛ ڕێـستن؛ ڕێـسان؛ ڕێـسەی؛ هۆربینـەی؛ بـە بـیر و خـەیـاڵ سـازدان ‹دروغ بافتن: درۆ هەڵبەستن›. هەروەها: **بافتنی**

■ صـفت فـاعلی: **بافنـــده** (هۆنـــەر)/ صـفت مفعـولی: **بافتـه** (هـۆنراو)/ مـصدر منفـی: **نَبـافتن** (نەهۆنین)

**بـافتنی** / bāftanî، ـهـا/: اسـم. ۱. ئـەوی بـە سـنگ، قـولاو یـان دەسـت و ماشـین چنـراوە ۲. ئـــەوی بـــە کـــاموا و بـــەن چنـــراوە (وەک جاکەت و گۆرەوێ).

**بافته** / bāfte، ـهـا/: اسـم. کـر؛ تـەنـراو؛ هۆنـدراو؛ هۆنـە؛ وەنـراو؛ چنـدراو؛ تـەنیـاگ؛ بافیـاگ؛ چنیـاگ؛ وەنـە؛ هـەڤرسـت؛ بـەرهـەمـی هۆنینەوە (وەک پارچە، قالی، تۆڕ و...).

**بافکـــار** / bāfkār، ـهـا؛ ـان/: اسـم. چنکـــار؛ چنیار؛ ڤەهۆنەر؛ هۆنـەر؛ کـەسـێ کـە پیـشەی هۆنینەوەیە.

**بافنـدگی** / bāfandegî/: /اسـم. ۱. چنیـاری ۲. چـنین؛ هێگـی؛ جـۆلایی؛ نـژی؛ تـەنـین؛ نژنیـت؛ جیلایـی؛ جـوولگی ۳. /ـهـا/ کارگـای چنین و ڕستن.

**بافنـده** / bāfande، ـها؛ ـگـان/: /اسـم. چنیـار؛ جۆلا؛ هۆنەر؛ ڤەهۆنەر؛ جولـیە؛ جـیلا؛ کـەسێ کە کاری هۆنینەوەیە.

**بافور** / bāfûr/: [از لاتینی] ☜ **وافور**

**بافـه** / bāfe/: /اسـم. ۱. /ـهـا/ بـن‌دەس؛ بـەسـە؛ باقە؛ باغە؛ باقێ؛ دەسـک؛ پـاکۆ؛ گـورز؛ گـورزە؛ گـوزرە؛ دەسـتەوار؛ هـوێزی؛ ئـەوەنـدەی لـە چلە گەنم، جۆ یان دەغلەکـانی‌تـر کـە لـە ژێـر هەنگڵدا جێیـان ببێتـەوە ۲. پـەلکـە؛ چـەپکـە؛ پەلکێ؛ دەسەقژێ ۳. کلافە.

**ـبافی** / bāfî، ـها/: پیوازه. ـچـنی؛ ـهـەڵـوەسـی؛ کار یا ڕەوتی چنین و هـەڵـبەسـتن ‹گیوەبـافی؛ دروغ‌بافی: گیوەچنی؛ درۆهەلوەسی›.

**باقالی** / bāqālî/: [از یونانی] ☜ **باقلا**

**باقـالی‌بـەچنـدمن** / bāqālîbečan(d)man/ ☜ **باقلا به چند من**

**بـاقرقره** / bāqerqere، ـهـا/: [ترکـی]/اسـم. کورکـور؛ کـورەکـور؛ قـەتـێ؛ کورکـورەی سـنگ‌ڕەش؛ پەلـەوەرێکی پچـووکتر لـە کـەو بە باڵ و جووچکەی درێژ و پای کورتەوە.

**بـاقلا** / bāqālā، bāq(e)lā، ـهـا/: [از یونـانی] /اسم. باقلە؛ پاقلە؛ باقیلە؛ بلوول * **باقالی**

▣ **باقلای خشک**: باقلـەی وشـک؛ دانـەـدانـەی باقلەی وشک‌کراو.

**باقلای سبز**: باقلەی سەوز؛ تەڕە باقلە.

**باقلابـەچنـدمن** / bāqālābečan(d)man، bāq(e)lā-/: /اسم. گەنم‌ـگەنم؛ گەنم‌ـگـەنمێن؛ جۆرێ گەمەیە، هەر یارێـک و ژمـارەیـەک، کـە ژمـارەکـەی گـوترا دەبـێ جـواب بداتـەوە و ژمارەیەکی‌تر ناو بەرێ کە نەسـووتاوە: **باقالی بـه چند من**

**بـاقلاپلو** / bāqālāpolow، bāq(e)lāpolo:/: [معرب از یونانی/ فارسـی]/اسم. باقلـه پـلاو؛ پـلاوی بەگۆشت و باقلە: **باقالی‌پلو**

**باقلاقـاتق** / bāqālāqātoq، bāq(e)lā-/: [یونـانی/ ترکـی]/اسـم. باقلاقـاتوق؛ خۆرشـتێکی تایبـەتی خەڵـکی گیلانـە، بـە باقلـە و سـیر و شـویت و هیلکـە و ڕۆن و خـوێ دروسـت دەکرێ.

**بـاقلوا** / bāqlavā، ـهـا/: [ترکـی]/اسم. بـاقلاوا؛ بـەقـلاوە؛ پـاقلاوە؛ بـەقـەوا؛ شـیرینیەکـە بەناوبانگ لـە ئـارد و ڕۆن و هیلکـە و شـەکـر و پستە و بادام.

**بـاقی** / bāqî، ـها؛ بقایا/: [عربـی]/اسم. ۱. مـاو؛ مـەن؛ مـێن ‹فـانی و بـاقی: مـاو و نـەمـاو› ۲. پاشماوە؛ ئـەوەمـەن؛ بـاقی ‹بـاقی کارهـا را بگـذار به عهده‌ی من: باقی کارەکان بێلا بۆ من›.

**باقیـاتصـالحات** / bāqîyāt(e)sālehāt/: [عربـی]/اسم. چاکـەی لـە دوومـاو؛ ئـەو کـارە باشانەی کە ئاسەواریان دەمێنێتەوە.

**باقیمانده** / bāqîmānde، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پەسمەنە؛ پـەسمـەنـدە؛ پاشمـاوە؛ پاشمـەنـدە؛ پاشمەنە؛ مەنە؛ مەندە؛ ئەوەمەنە؛ باقی؛ باقی‌ماو؛ تەکوو؛ ئەوەی کە دوای کار یـان ڕووداوێـک لـە شتێ مابێتەوە.

**بـاک** / bāk/: /اسم. بـاک: ۱. تـرس؛ تـەرس؛ پـەروا؛ سـامی؛ یـاس ‹از دشـمن بـاک نـداریم: لـە دژمـن ترسمـان نیـە› ۲. [فرانـسوی] بـاک؛ دەفری جێ سووتەمەنی موتور لە ماشێن.

**بـاکرگی** / bākeregî/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. کچی؛ کچیەتی؛ کەنیشکی؛ کناچەیی.

**بـاکره** / bākere، ـهـا/: [عربـی] صـفت. کـچ؛ کـەنیـشک؛ کناچـێ؛ دویـت؛ دەژ؛کچـێ کـە هێشتا شووی نەکردبێ.

**بـاکلاس** / bākelās/: [فارسـی/ فرانسوی] صفت. [گفتـاری] بـاکلاس؛ ژمـاردە؛ بـژاردە؛ بـەرچـاو

‹آدم باکلاسی است: مرۆڤێکی بژاردەیە›.

**باکلان** / bāklān، ـها/:/اسم. قەڵمراوی؛ پەلەوەرێکی ملدرێژ و دەندووک باریکی قولاپین و بێپەردەیە کە زۆرتر لە قەراخ زەریاگەلی ناوچەی فێنک و گەرمێندا دەژێ و گەرمیان و کوێستان دەکا.

**باکلە** / bākalle، ـها/: صفت. [گفتاری] هۆشیار؛ خاوەن بیر و هۆش.

**بال** / bāl، ـها/:/اسم. ۱./ـان/ باڵ؛ کەنگ؛ پەل؛ باڵی باڵندە؛ ئەندامی فڕینی باڵدار ۲. / ـان/ باڵ؛ چنگ؛ کەنگ؛ ئەندامی وەکوو باڵی برێ پەلەوەر(وەک مریشک) کە بۆ فڕین نابێ ۳. باڵ؛ شتێکی وەکوو باڵ کە گوایە خودایان، فریشتەکان و شەیتانگەل پێی ئەفڕن ٤. باڵ؛ کەنگ؛ باڵی باڵینە و فڕۆکە ٥. هەرشتێکی وەکوو باڵی باڵندە ٦. چارەوەز؛ توێک؛ تۆکڵ؛ چەرمک؛ کاژ؛ پۆستک؛ پەردە؛ پەردەیێک ناسک یا گەلائاسا کە لاسک، میوە یان دانەی برێ گیا هەیەتی ٧. لێوارەی تیرئاسن ٨. [مجازی] باڵ؛ باسک؛ لە ئەنگوستەوە هەتا شانە ٩. باڵ؛ لا؛ هەریەک لە دوو لای چەپ و ڕاست ١٠. [نامتداول] هەڵپەڕکێ؛ لەیز؛ ڕەقس؛ سەما ١١. [نامتداول] کۆڕی هەڵپەڕکێ.

▣ **بال افکندن**: [مجازی] بێدەس بوون؛ پەککەوتن؛ بێهێز بوون؛ لە کار کەوتن؛ بێ باسک بوون.

**بال به بال کسی دادن**: [مجازی] شان بە شانی کەسێک دان؛ لە گەڵ کەسێکدا هاوکاری و هاودڵی کردن.

**بال درآوردن**: [مجازی] پا لە زەوی بڕیان؛ باڵگرتنەوە؛ باڵی گێرتەیەوە؛ زۆر شاد و کەیفخۆش بوون.

**بال زدن**: ۱. باڵ لێدان؛ باڵەفڕێکردن؛ باڵشەنین؛ باڵی فڕنەی ۲. [گفتاری] پەلەقاژێکردن؛ لاقەفرتێکردن؛ لەقەفڕێ کەردەی؛ پێچ خواردن (لەبەر ئازار یان بێدەستەلاتی).

**بال شکستن**: [مجازی] ۱. باڵ شکاندن؛ دەس بەستن؛ بێهێزکردن ۲. باڵ شکان؛ دەسبەسیان؛ بێهێز بوون.

**بال و پر دادن**: [مجازی] پشت پتەوکردن؛ پشت ئەستوورکردن؛ پشت قایمکردن، هێز و توان پێدان.

زیر بال رفتن ☜ **زیر**[۳]

**بالا**[۱] / bālā/: اسم. ۱. سەر؛ بۆ لای ئاسمان ‹بالا را نگاه کن: بۆ سەرەوە بڕوانە› ۲. [ادبی] بان؛ بالا؛ هەنداف؛ هەنداو؛ سەر؛ جێگەی چاکتر ‹بالا نشین: بالا نشین› ۳. بالا؛ بەژن ‹بلند بالا: بالا بەرز›.

**بالا**[۲]: صفت. ۱. سەروو؛ ژوور؛ سەرین؛ هەنداف ‹ده بالا: گوندەی ژووروو› ۲. گران؛ زۆر؛ سەر؛ بان؛ فرە؛ فریە ‹قیمت بالا: گرانبایی› ۳. سەروو؛ گەورە؛ سەر ‹مقام بالا: خاوەن پلەی سەروو›.

**بالا**[۳]: قید. ۱. لە سەر؛ سەر؛ لە بان؛ هەنداف؛ هەنداو؛ لای سەروو ‹بالای دیوار نشسته بود: لە سەر دیوار دانیشتبوو› ۲. لای ژوور؛ لای ژوورگ؛ سەر؛ لەو پەڕ ‹بالای حیاط میز چیده بودند: لای ژووری حەوشەکەوە مێزیان چنیبوو› ۳. سەر؛ سەرەوە؛ سەرۆ؛ هۆسەر؛ بەرەو شوێنی بەرزتر ‹برو بالا: بچۆ سەرەوە›.

▣ **بالا آمدن**: هاتنە سەر؛ هاتنە بان؛ ئامەی سەر: الف) هەڵهاتن؛ هۆرئامەی؛ زۆر بوونی بەرزایی شتێک ‹بالا آمدن آب: هاتنە سەری ئاو› ب) بەرەو بەرزی چوون ‹از چاه بالا امدن: لە چاڵ هاتنە بان›.

**بالا انداختن**: ۱. هەڵخستن؛ هەڵدان؛ حەوادان؛ هۆروسەی؛ هۆرئازەی؛ فڕێدانی

شتێک بەرەو سەر ۲. *[کنایی]* نانە سەرەوە؛ هەڵچۆڕاندن؛ هەڵقوڕان؛ هەڵنۆشین؛ خواردنەوە ‹دو کاسه آب بالا انداخت: دوو پیاڵە ئاوی نایە سەردەوە›.

**بالا آوردن**: ۱. ڕشانەوە؛ وەڕشان؛ وەڕشین؛ هەڵاوردنەوە؛ هەراژان؛ قەی کردنەوە؛ هۆرئاردەی ۲. هاوردنە بان؛ بەرەو سەر هێنان؛ هێنانە سەر؛ ئاردەی سەر؛ هەڵهاوردن؛ هەڵهێنان.

**بالا بردن**: بردنە سەرەوە؛ هەڵدانەوە؛ بەرز کردنەوە: ۱. بردنە بان؛ هەڵبرین؛ هۆربرنەی؛ بەرەو سەرەوە بردن ۲. *[مجازی]* شتێک پەرەپێدان و زۆرکردن ‹بالا بردن قیمت: بردنە سەرەوەی نرخ›.

**بالا زدن** ☜ **بالاکشیدن ـ۱**

**بالا کشیدن**: ۱. هەڵدانەوە؛ هەڵکردن؛ هۆردایوە؛ هەڵکشان بەرەو سەرەوە ‹بالا کشیدن پرده: هەڵدانەوەی پەردە›: **بالا زدن** ۲. بەرەو ژوور حەوادان؛ هەڵکێشان؛ کێشانە سەر؛ هۆرکێشتەی؛ بۆ لای سەرەوە پاڵ پێوەنان ۳. *[کنایی]* خواردن؛ خستنە ئەو لای خۆوە؛ ماڵی خەڵکی خواردن ‹پول مردم را بالا کشید: پارەی خەڵکی خوارد›.

**بالا گرفتن**: ۱. *[کنایی]* پەرە سەندن؛ پێشرەفت کردن ‹بالاگرفتن جنگ: پەرەسەندنی شەڕ› ۲. بەرزکردنەوە؛ هەڵگرتن؛ هەڵبرین؛ هۆربرنەی؛ هۆرگێرتەی؛ لە سەرترەوە ڕاگرتن ‹پایت را بالا بگیر: پێت بەرز بکەرەوە› ۳. *[قدیمی]* بەرز بوون؛ بالا کردن؛ هەراش بوون ‹درخت بالا گرفت: دارەکە بەرز بوو›.

**بالاـ**[4] : *پیشواژە*. هەنداو ـ ؛ بالاـ ؛ والاـ ؛ بەرز ـ: ۱. سەبارەت بە سەرەوە؛ بان ـ ؛ ـ سەروو ‹بالاشهر: بان‌شار› ۲. گەورە ـ ؛ گەپ ـ ؛ گەورەتر؛ زۆرتر؛ هەراوتر؛ پانتەر؛ واڵ؛ والا ‹بالاخانواده: گەورەماڵ›.

**بالائی** / bālā'î/ ☜ **بالایی**

**بالابان** / bālābān، ـها/:*اسم.* باڵەبان: ۱. [روسی] ئامرازێکی مووسیقایە، وەک بلوێر و شمشاڵ ۲. باڵەوان؛ مەلێکی ڕاوچیە.

**بالابر** / bālābar، ـها/:*اسم.* ۱. ئامرازی بردنە سەری بار ۲. ئاسانسور.

**بالابلند** / bālāboland/ ☜ **بلندبالا**

**بالابلندی** / bālābolandî/:*اسم.* گەمەیێکی مندالانەیە لە دەرەوەی ماڵدا دەکرێ، بەم جۆرە کە ئەو کەسەی دۆڕاندوویە (گورگە) دەست بدا لە هەرکام لە هاوەڵەکانی، دەچێتە جێگای ئەو و گەمەکەران ئەگەر بترسن یان هەست بە مەترسی دۆڕاندن بکەن، دەبێ بچنە جێگایێکی بەرزتر لە ئاستی زەوی (وەک بان پلە و سەر بەرد و...) تا لەوێ بمێننەوە و نەبزوێن، دەستی گورگەیان پێ ناگا.

**بالابود** / bālābûd/:*اسم.* پاشماوە؛ پاشمەنە؛ ماوە؛ باقی ‹خانەات را بدە یکی بزرگتر بگیر، بالابودش را ماهیانە بپرداز: ماڵەکەت بگۆڕەوە و گەورەترێ بکرە، پاشماوەکەی مانگانە بدەوە›.

**بالاپوش** / bālāpûš، ـها/:*اسم.* بالاپۆش: ۱. ئەوەی کاتی خەو دەیدەنە ڕووی خۆیاندا ۲. کەوا؛ شتێ کە لە بان جل و بەرگیترەوە دەیکەنە بەر.

**بالاتنە** / bālātane، ـها/:*اسم.* بالاتەنە: ۱. لای سەرووی لەش ۲. کنج؛ گنج؛ ئەو بەشە لە جل و بەرگ وا بالاتەنە ئەپۆشێنێ ‹بالاتنەاش تنگ است: بالاتەنەکەی تەنگە›.

**بالاخانە** / bālāxāne، ـها/:*اسم.* سەرخان؛ بالاخانە؛ سەرا؛ ژوورێ کە لە نهۆمی سەرەوەیە.

◘ **بالاخانە را اجارە دادن**:*[کنایی]* ئاوەز تێکچوون ‹یارو بالاخانەاش را اجارە دادە: کابرا

ئاوەزی تێکچووە›.

**بالاخره** / bel'axare, belaxare/: [از عربی] *قید.* ئاخری؛ سەرەنجام؛ لە ئاکامدا؛ ئاخرەکەی ‹بالاخره آمد؛ بالاخره موفق شد: سەرەنجام هات؛ ئاخری سەرکەوت›.

**بالاخص** / bel'axas/: [عربی] *قید.* نەخوازە؛ نەخازە؛ نمازە؛ ناوازە؛ نەخوازەلا؛ نەوازا؛ بەتایبەت؛ بەتایبەتی.

**بالاخوانی** / bālāxānî، ـها/: *اسم.* هووشەکەری؛ بافیش‌کەری؛ شات و شووتی؛ چاپ و چۆپی؛ بافیشی؛ گروفڕی.

**بالاد** / bālād/: [فرانسوی] *اسم. [موسیقی]* بالاد؛ ئاواز یا مووسیقایێک هاوڕێ لەگەڵ سەمادا، کە چیرۆکێک بگێڕێتەوە.

**بالاداری** / bālādārî، ـها/: *اسم.* پشتیوانی؛ هەواداری؛ داکۆکی؛ لایەنگری؛ لاگری؛ پشت‌گری؛ داژداری.

**بالادست**[1] / bālādast، ـها/: *اسم.* هەنداو؛ هەنداف؛ لای‌سەروو؛ لای‌ژووروو ‹بالادست رودخانه: هەنداوی چەم›.

**بالادست**[2]: *صفت.* زت؛ بالادەس؛ گەورەتر؛ سەرتر؛ بەرزتر؛ بە پلەوپایەی بەرزترەوە.

**بالادستی** / bālādastî/: *اسم. [گفتاری]* بالادەس؛ سەرتر؛ سەرتەر؛ بان؛ پلەبان ‹من هم باید به بالادستی خودم جواب بدهم: منیش دەبێ بە سەرتر لە خۆم وڵام بدەمەوە›.

**بالار** / bālār، ـها/: *اسم.* ماخ؛ شاتیر؛ کاریتە؛ گاریتە؛ نیرگە؛ دیرەگ؛ دیلەک؛ گرس؛ حەماڵ؛ بەرازە؛ ڕاژ؛ ڕەوانی؛ لیرەکی میچ؛ کاریتەی سەربان.

**بالارو** / bālārow، ـها/: *صفت. [گفتاری]* خاوەن تایبەتمەندی بەرەو سەر چوون.

**بالارونده** / bālāravande، ـها/: *صفت.* هەڵچوو؛ هەڵبەز؛ هۆروەز؛ خاوەن نرڤانی بەرەو سەران ‹گیاه بالارونده: گیای هەڵبەز›.

**بالاسر** / bālāsar/: *اسم.* هەنداف؛ هەنداو؛ لای سەروو؛ لای ژوورگ.

**بالاغیرت** / bālāqayrat/: [فارسی/ عربی] ☜ **بالاغیرتاً**

**بالاغیرتاً** / bālāqeyratan/: (!) [فارسی/ عربی] *دعا. [گفتاری]* پیاوانە؛ مەرد و مەردانە ‹بالاغیرتا بیا و آشتی کن: پیاوانە وەرە و ئاشت بەرەوە›.

**بالافروشی** / bālāfurûšî، ـها/: *اسم. [گفتاری]* لووت‌بەرزی؛ خۆبەزل‌زانی؛ باغری؛ بافیشی؛ دەماربەرزی؛ گەوەزەیی.

**بالالایکا** / bālālāykā، ـها/: [روسی] *اسم.* بالالایکا؛ ئامرازێکی مووسیقایی ڕووسی لە بیچمی گیتارە و گەورە و پچووکی هەیە.

**بالان** / bālān، ـها/: *اسم. [قدیمی]* ۱. دالان؛ ڕێگەی دوو پاڵ دیواری سەرداپۆشراو ۲. *[قدیمی]* داو؛ تەڵە؛ فاق؛ فاقە؛ ئامرازی ڕاو.

**بالاندن** / bālāndan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* ۱. ڕاخستن؛ بەڵاوکردنەوە؛ بڵاوکردنەوە؛ وڵاونەی؛ پانەوکردن ۲. گەشە پێدان؛ بالا پێدان؛ بەخێوکردن؛ گەورەکردن؛ پەرە پێدان. هەروەها: **بالاندنی**

**بالانس** / bālāns/: [فرانسوی] *اسم.* ۱. قەڵانتۆچ؛ لە سەر سەر و دەست وێستان ۲. تراز؛ ترازی بەنا ۳. هاوسەنگ.

⊡ **بالانس زدن:** قەڵانتۆچ‌کردن؛ پشتەک لێدان؛ تەقلە لێدان.

**بالانس کردن:** ڕێک‌کردن؛ پۆڕاندن؛ هاوسەنگ‌کردن؛ هەڵپەرتاوتن؛ مرێس کردن؛ هەڵوەژارتن.

**بالانشین** / bālānešîn، ـها؛ ـان/: *صفت. [مجازی]* بالانشین؛ پلەبان؛ مەقام‌بان؛ ژوورنشین. هەروەها: **بالانشینی**

**بالایی**[1] / bālāyî/: *صفت.* سەروو؛ سەرقە؛ سەرین؛ هەنداوی؛ سەرگین؛ ژوورگین؛

بانین؛ بالایی؛ بانی؛ لە لای ژووروو ‹کتاب بالایی: کتێوی سەروو›.

**بالایی**[۲] / ـها/: ضمیر. بانین؛ ژوورین؛ سەروو؛ سەرین؛ سەرگین؛ بانگین؛ هەرچی کە لە بان/ ژووری ئەوانیتروە بێ ‹درخت بالایی را انداختند: دارە سەرووەکەیان داراندەوە›.

**بالبرینگ** / bālberîng/: [انگلیسی] ☜ **بُلبرینگ**

**بالپوش** / bālpûš، ـها؛ ـان/: اسم. قاپۆلکە؛ باڵی بەرووی قالۆنچان و هێندێ مێرووی‌تر کە دوو باڵی ژێرین و دوایین و سەرەکییان دادەپۆشێ.

**بالت** / bālet، ـها/: [فرانسوی] اسم. بالێت: ۱. سەمایێکی شانۆیی بۆ دەربڕینی داستانێکی ڕەچاوکراو ۲. مووسیقای ئەو سەمایە * **باله**

**بالتی** / bāltî/: اسم. باڵتی؛ لە دەستە زمانگەلی هێندو ئورووپایی کە زمانی لیتونیایی و زمانی لیتوانیاییش دەگرێتە بەر.

**بالدار** / bāldār، ـها؛ ـان/: صفت. باڵدار؛ باڵندە؛ پەلەوەر؛ پەلەور.

**بالرین** / bālerîn، ـها/: [فرانسوی] اسم. بالێریەن؛ پیاوی سەماکەری بالێت؛ پیاوێ کە بالێت ڕێک دەخا.

**بالرینا** / bālerînā، ـها/: [فرانسوی] اسم. بالێرینا؛ ژنی سەماکەری بالێت؛ ژنێ کە بالێت ڕێک دەخا.

**بالش** / bāleš، ـها/: اسم. باڵشت؛ باڵنج؛ باڵگە؛ بالیف؛ بالێن؛ پالێف؛ بالیفگ؛ سەرنگا؛ سەرەنگا؛ سەرینگا؛ سەرەنگیا؛ سەرین؛ سەنیا؛ سەرینا؛ سەرنا؛ ژێرسەر؛ ژێرسەرە؛ گوژنەو؛ بەهلنگی؛ پاستۆخ؛ کیسەیەکی پڕکراو لە شتێکی نەرم وەک پەل، لۆکە و... کە کاتی خەوتن یان وچان دان دەنرێتە ژێر سەر.

▣ **بالش نرم زیر سر کسی گذاشتن**: *[مجازی]* کەسێ دڵخۆش کردن.

**بالشتک** / bāleštak، ـها/: اسم. ۱. پاڵشتەگ؛ پاڵشت؛ پاڵپشت؛ باڵشتی چکۆلە ۲. ماگە؛ ماڵگە؛ مادێ؛ باڵێنە؛ ڕفێدە؛ مەزرکە؛ مەزرۆکە؛ مەزرەکە؛ مەزرەقە؛ باڵشتئاسایەکی خڕت یان درێژۆکەیە کە هەویری لە سەر پان دەکەنەوە و پێی دەیدەنە تەنوورەوە ۳. *[زیستشناسی]* پەچۆڵە؛ چەپۆڵە؛ بەشی نەرمی پا و دەستی پشیلە و شێر و بەبر و... * **بالِشک**

▣ **بالشتک ساچمه‌ای**: بولبورینگ.

**بالشتک لغزشی**: یاتاغان؛ یاتاقان.

**بالشک** / bālešak/ ☜ **بالِشتَک**

**بالشویسم** / bālševîsm/: [انگلیسی] ☜ **بُلشِویسم**

**بالشویک** / bālševîk/: [انگلیسی] ☜ **بُلشِویک**

**بالصراحه** / bessarāhe, besserāhe/: [عربی] قید. ڕەپ و ڕاست؛ ڕووت و ڕاس؛ بە ڕاشکاوی؛ بە ئاشکرایی؛ بێڕووبینی؛ پانەوپان ‹بالصراحه بگویم که من با شما نیستم: ڕەپ و ڕاست بێژم من لەگەڵ ئێوەدا نیم›.

**بالطبع** / bettab'/: [عربی] قید. بێ‌گومان؛ دیارە؛ دیارا؛ بێشک ‹بالطبع این طور نمی‌توان کار کرد: بێ‌گومان ئاوا کار ناکرێ›.

**بالعکس** / bel'aks/: [عربی] قید. پێچەوانە؛ بە پێچەوانەوە؛ بە ئاوەژوو ‹راه سنندج به مریوان و بالعکس: ڕێگای سنە بۆ مەریوان و پێچەوانەی›.

**بالغ**[۱] / bāleq، ـها/: [عربی] صفت. پێگەیو: ۱. پێگەیشتوو ۲. خۆناسیو ۳. *[اسلام]* باڵغ؛ باڵق؛ بلۆق؛ بلۆقەت؛ خاوەنی تەمەنی پێویست بۆ ئەنجامدانی ئەرکی ئایینی (کوڕ ۱۵ ساڵ و کچ ۹ ساڵی ڕەبەق) ٤. *[حقوق]* باڵغ؛ باڵق؛ خاوەن تەمەنی قانوونی (زۆرتر ۱۸ ساڵ).

▣ **بالغ شدن**: ۱. باڵق بوون؛ پێ‌گەیین؛ پێ‌گەیشتن؛ پنە یاوەی ‹دخترها زود بالغ

می‌شوند: کچان زوو پی‌ده‌گه‌ن› ٢. دانه‌بان؛ پتر بوون؛ زیاتر بوون ‹خرج آن به یک میلیون تومان بالغ شد: خه‌رجی له یه‌ک ملیۆن تمه‌ن دایه بان›.

**بالغ**^٢: *قید*. فره؛ زۆر؛ زیاد؛ زیاده؛ پتر.

◘ **بالغ بر**: پتر له؛ بانتر له؛ زۆرتر له؛ فره‌ته‌رجه ‹بالغ بر یک میلیون تومان خرج برداشت: پتر له یه‌ک ملیۆن تمه‌ن خه‌رجی هه‌لگرت›.

**بالفعل** / belfe'l/: [عربی] *قید*. وه‌دیهاتوو؛ ئه‌وه‌ی که ئێستا له به‌ر چاوه.

**بالقوه** / belqovve/: [عربی] *قید*. شیاوی وه‌دیهاتن؛ ئه‌وه‌ی که ده‌کرێ بێته‌کایه‌وه.

**بالکل** / belkol/: [عربی] *قید*. به ته‌واوی؛ یه‌کسه‌ر؛ یه‌که‌ژه؛ یه‌که‌ره؛ ئه‌له‌ک ته‌واو؛ ته‌واو ـ ته‌واو؛ به ته‌واوه‌تی؛ به یه‌کجاری ‹خانه‌اش بالکل سوخت: ماله‌که‌ی یه‌کسه‌ر سووتا›.

**بالکن** / bālkon، ـها/: [فرانسوی] *اسم*. ١. پێش‌هێوان؛ سه‌رڕه‌پان؛ به‌ربانیژه؛ به‌رهێوان؛ پێش‌په‌نجه‌ره؛ بانیژه؛ بانیجه؛ بانیجه‌له؛ به‌ربانیجه؛ بانیژه‌له؛ به‌رپه‌نجه‌ره؛ به‌رستاتی؛ هه‌واله ٢. پاسارگا؛ شانشین.

**بالگرد** / bālgard، ـها/: *اسم*. هیلی‌کوپته‌ر؛ هه‌لی‌کوپتیر.

**بالله** / bellāh, bellā/: [عربی] *دعا*. بیللا؛ به خوا؛ به خودا؛ به خولا؛ به وه‌للا؛ وه‌لا؛ سوێند به خوا ‹بالله نمی‌دانم: وه‌للا نازانم›.

**بالماسکه** / bālmāske، ـها/: [فرانسوی] *اسم*. کارنه‌وال؛ کۆڕی هه‌لپه‌ڕکێ که یاریکه‌ران ماسک لێده‌ده‌ن و خۆ ده‌گۆڕن.

**بالمره** / belmarre/: [عربی] *قید*. *[ادبی]* یه‌کجار؛ یه‌کسه‌ر؛ یه‌کسه‌ره؛ یه‌ک ته‌کان؛ ده‌رانده‌ر؛ یه‌کجاری؛ به یه‌کجاری؛ یه‌کرا؛ یه‌که‌ره؛ یه‌که‌ژه؛ یه‌که‌شه ‹هر چه داشتیم بالمره از دستمان رفت: هه‌رچێکمان بوو به یه‌کجاری له ده‌سمان چوو›.

**بالمناصفه** / belmonāsefe/: [عربی] *قید*. *[ادبی]* نیوه ـ نیوه، نیوه‌به‌نیوه؛ نیوا و نیو؛ نیمه و نیم؛ له‌تاوله‌ت ‹پول را بالمناصفه تقسیم کرد: پاره‌که‌یان نیوه ـ نیوه به‌ش‌کرد›.

**بالن** / bālen/: [فرانسوی] ☜ **وال ـ٢**

**بالن** / bālon، ـها/: [فرانسوی] *اسم*. بالۆن: ١. تیزانگی زۆر گه‌وره ٢. کیسه‌ی زه‌لامی فوودراوی پڕ له گازی گه‌رم یان سووک که به هه‌وادا ده‌چێ و پێی بال ده‌گرنه‌وه: **بالون** ٣. تۆنگ؛ تۆنگه؛ ده‌فری مل‌باریک و قه‌له‌و بۆ ئاو.

◘ **بالن ارلن مایر**: بالۆنی ئێرلێن‌مایر؛ ده‌فری له شیشه که له لابراتۆری کیمیاکاریدا کاری پێده‌کرێ و یه‌کێ هه‌ر به‌م ناوه دروستی کردووه.

**بالن ژوژه**: بالۆن ژوژه؛ تۆنگی خه‌ت لێدراو بۆ پێوانه له لابراتۆری کیمیادا.

**بالنتیجه** / bennatîce/: [عربی] *قید*. له ئاکامدا؛ سه‌رئه‌نجام؛ له ئاخردا؛ ئاخری؛ ئاخره‌که‌ی؛ له سلدا ‹بالنتیجه فروش خوبی کرد: له ئاکامدا فرۆشێکی چاکی‌کرد›.

**بالندگی** / bālandegî، ـها/: *اسم*. خیف: ١. هه‌راشی؛ بنه‌دایوه؛ هه‌لاشی (بۆ گول و گیا)؛ دۆخ یان چۆنیه‌تی گه‌وره بوون یان بالا کردن ٢. هه‌لچوویی؛ گه‌وره بوویی؛ گه‌شه‌یی؛ گه‌شه‌داریه‌تی ‹بالندگی تمدن: گه‌شه‌داریه‌تی شارستانیه‌ت›.

◘ **بالندگی کودک**: بازه‌له‌یی؛ مزکه‌له‌یی.

**بالنده** / bālande، ـها؛ ـگان/: *صفت*. هه‌لچوو؛ هه‌راش؛ هه‌ره‌ش؛ هه‌راس؛ تیر؛ خاوه‌ن تایبه‌تمه‌ندی به‌خۆدا هاتن و هه‌لچوون.

**بالنسبه** / bennesbe/: [عربی] *قید*. تا راده‌یه‌ک؛ تا ئه‌ندازه‌یه‌ک؛ هێندێک ‹آدم

باسـواد بالنسبه کـم نیـست: مـرۆی خوێنـەوار تـا ئەندازەیەک کەم نین›.

**بالنگ** / bālang، ـها/:/اسم. باروونە؛ بارۆنە: ۱. بنچکێکە لە تیرەی مرەکەبات کە لە ناوچەی گەرمێن دەڕوێ ۲. بەری ئەو بنچکە کە پتر بۆ مرەبا بەکار دێ: **تُرنج** ❋ **بادرنگ**

**بال‌وپر** / bāl-o-par/ ☜ **پر و بال**

**بالون** / bālûn/: [فرانسوی]/اسم. بالۆن: ۱. *[قدیمی، گفتاری]* فڕۆکە ۲. ☜ **بالُن**

**بالونه** / bālûne/ ☜ **پالونه**

**بالـه** / bāle، ـها/:/اسم. ۱. پەل؛ باڵ؛ ئەندامێک لە لەشی ماسیدا کە بۆ مەلە و خۆگرتن بەکاری دێ ۲. باڵە (بۆ فڕۆکە).

◙ **بالـەی پـشتی**: شـاپەڕە؛ شاباڵ؛ شـاپەڕەی پشتی؛ پەلێ کە لە پشتی ماسیەوەیە. هەروەها: **بالەی دمی؛ بالـەی سینەای؛ بالـەی شکمی**

**باله** / bāle/ ☜ **بالِت**

**بالیـدن** / bālîdan/: مصدر. لازم. *[ادبی]* //**بالیدی**: هەڵتدا؛ **میبالی**: هەڵدەدەی؛ **ببال**: هەڵدە// ۱. هەڵدان؛ هەڵچوون؛ باڵا کردن؛ گەشەکردن؛ گەشەکردن؛ بنەوەدەی؛ دەباڵ‌کردن؛ لیفاندن؛ هەرەش بیەی ۲. شانازی‌کردن؛ نازین ‹او بە داشتن چنان پسری بە خود میبالید: بە ئاوەها کوڕێ شانازی دەکرد›.

■ صفت فاعلی: **بالنـده** (ــ)/ صفت مفعولی: **بالیـده** (هەڵداو)/ مصدر منفی: **نَبالیـدن** (هەڵنەدان)

**بـالین** / bālîn/:/اسم. ۱. سەرین؛ سەرینا؛ باڵنج؛ سەنگا؛ سەنیا؛ سەرنا؛ سەرنگا ۲. جێخەو؛ جێ؛ جێگە؛ پێخەف؛ بالیفک؛ نوێن؛ نقین.

**بالینی** / bālînî/ ☜ طبّ بالینی، **طب**

**بام** / bām، ـها/:/اسم. ۱. بان؛ بۆن؛ خەرشت؛ بانی خانوو یان ئامێرانی (وەک ماشین، گەمیە، قەتار) ۲. بان؛ بانماڵ؛ سەربان (هەر بۆ ماڵ دەگوترێ) ۳. *[ادبی]* سەر لە بەیان؛ بەربەیان؛ بەیانی؛ شەوەکی؛ شەبەق؛ نەماژی؛ نەماجی؛ چەوسەر؛ سپێدە زوی ‹از بام تا شام: سەر لە بەیان تا نوێژی شەوان›.

◙ **بام تکشیب**: بانی یەکلالێژ؛ بانی یەک لا؛ بانی یەک لایەنە؛ بانێ کە ئاوی بە لایێکیدا برژێ.

**بام شیبدار**: لێژەبان؛ بانی لێژ؛ سەربانی لێژ؛ سەربانی لار؛ بانی شیودار؛ بانێک کە لێژیەکەی زیاتر لە ۱۰ پلەکە.

**بـام کمرشکن**: بانی دوولا لێژ؛ بانی دوولا؛ بانی دوولایەنە؛ بانێ کە ئاوەکەی بە دوو لادا برژێ؛ بانێک کە دوو لێژایی پێدراوە.

**یک بامَ و دو هوا** ☜ **یک**[۲]

◘ **از بام کسی کوتاهتر پیدا نکردن**: *[کنایی]* داماوتر لە کەسێک گیر نەهێنان؛ کەسێک بە بۆنەی بێدەسەلاتیەوە ئازاردان و ڕەخنە تێگرتن.

**بـامبو** / bāmbo، ـها/: [فرانسوی از پرتغالی]/اسم. بامبوو؛ خەیزەران؛ حەیزەران؛ هەزیران؛ تەرگەز؛ ئارج؛ قامیشی هیندی؛ قامیشی گەرمیان.

**بـامبول** / bāmbûl، ـها/:/اسم. *[گفتاری]* فێڵ؛ فێڵە؛ پیلان؛ گزی؛ گزە؛ گەڕ؛ گەژێ؛ کەڵەکە؛ هەنگ؛ فەن و فێڵە؛ فێڵ و تەڵەکە.

◘ **بامبول در آوردن** ☜ **بامبول سوار کردن**

**بامبول زدن** ☜ **بامبول سوار کردن**

**بـامبول سـوارکردن**: ڕێوی فێڵ‌کردن؛ فێڵەبازی‌کردن؛ گزی‌کردن؛ گەڕ تێهالاندن؛ فێڵ لێکردن ‹صاحبخانه بامبول تازەای سوارکرد: خاوەن ماڵ فێڵەبازیەکی تری

کرد›. هەروەها: **بامبول درآوردن؛ بامبول زدن**

**بامبە** / bāmbe/: *اسم.* چەپۆک؛ چەپووک؛ چەپۆکە؛ بە لەپی دەست دان بە تەپلی سەردا.

**بامبی** / bāmbî/: *قید. [گفتاری]* بە چەپۆکە؛ بەچەپۆکان؛ بەچەپەکۆک ‹هاجر بامبی زد توی سر خودش: هاجەر بە چەپۆکان دای بە سەری خۆیدا›.

**بامپوش** / bāmpûš/: *اسم.* بانپۆش؛ بانگر؛ تیکەی ئامادەکراو بۆ داپۆشانی بان.

**بامداد** / bāmdād، ـها؛ ـان/: *اسم.* ١. بەیانی؛ سەبا؛ سوای سالحان؛ سەمەر؛ سوب؛ سۆح؛ سەرسۆح؛ کاتی دوای نیوەشەو هەتا بەرلە نیوەرۆ ‹ساعت چهار بامداد: کاتژمێرچواری بەیانی› ٢. *[قدیمی]* بوولێلە؛ سپێدە؛ بەرەبەیان؛چەوسەر؛ هەوەڵی ڕۆژێ؛ سوای سالحان؛ قیرا؛ تاریک و ڕوون؛ بوولێلەی بەیان؛ نەماژێ؛ نەماجی؛ کاتی کازیوە هەتا هەڵاتنی خۆر.

**بامدادان** / bāmdādān/: *قید. [ادبی]* سپێدە؛ بەیانان؛ سبحەینان؛ سبەینان؛ بەیانی زوو؛ بنەڕۆژە؛ لە سەرەتای ڕۆژدا.

**بامدادی** / bāmdādî/: *صفت.* سەر لە بەیانی؛ پێوەندیدار یان سەر بە بەیان ‹خبرهای بامدادی: هەواڵەکانی سەر لە بەیانی›.

**بامزه** / bāmaze/: *صفت. [گفتاری]* شیرین؛ مەکین (بۆ نێر)؛ مەکینە (بۆ مێ)؛ مژەدار؛ خۆش و دڵبزوێن کە دەبێتە هۆی پێکەنین و خۆشی.

**بامغلتان** / bāmqaltān، ـها/: *اسم.* بانگوێر؛ بانگلێر؛ بانگێر؛ بانتلێر؛ بانتلێن؛ بان تلین؛ باگردان؛ باگردێن؛ بانگووش؛ شەولەبان؛ بانگەڕ؛ بانگۆش؛ بانگردێن؛ باگوردێن؛ هاتوڕ؛ بان گلان؛ مەندەروونە؛ تەبانە؛ لۆغ؛ گردەڵ؛ باگوردان: **بامغلطان**

**بامغلطان** / bāmqaltān/ ☜ **بامغلتان**

**بام‌ودر** / bām-o-dar/: *اسم. [ادبی، کنایی]* دەر و دووژ؛ دەر و بان؛ دەرک و بان؛ دەریا و بان؛ بەر و بان؛ دەرک و دەروازە؛ دەروو یانە؛ دەوروبەری ماڵ و خانوو.

**بامیه** / bāmiye، ـها/: [یونانی] *اسم.* بامێ؛ بامیە؛ بامیێ: ١. گیایەکی دەسچنی گەلاپانی یەک ساڵەیە، گەڵاکانی لە گەڵای گوڵە هێرۆ دەچێ و گوڵێکی جوانی سپی مەیلەو زەردی شینباوی دەکا، ناوەڕاستەکەی قاوەیی مەیلەو سوورە ٢. بەری ئەم گیایە کە درێژۆکە (وەکوو بەڕوو) تووکن و تیژ و تراشە و دەگەڵ گۆشت و تەماتە دەکرێتە خۆرشت یا شۆربای گۆشت ٣. جۆرێک شیرینی ئێرانی وەک میوەی گیای بامیە کە لە ئارد، ڕۆن، هێلکە و شەکەر دروستی دەکەن.

**بان**[1] / bān/: *اسم.* بان؛ داری تایبەتی باکووری هیندووستان، کە لە دانەکەی ڕۆنێکی بۆنخۆش دەگرن.

**ـ بان**[2] / ـها؛ ـان/: *پسوند.* ـبان؛ ـوان؛ ـڤان؛ ـئەوان؛ پارێزەر؛ چاودێر ‹نگهبان؛ باغبان: نگابان؛ باخەوان›.

**بانتو** / bāntû/: *اسم.* بانتوو: ١. پۆلێکی گەورە لە ڕەگەزی خەڵکی ڕەش پێستی دانیشتووی ئەفریقای ناوەڕاست و باشوور ٢. /ها/ هەرکام لە کەسانی ئەو ڕەگەزە ٣. دەستەیێکی گەورە لە زمانگەلی ئەفریقایی لە لقی زمانی حامی (بریەتیە لە چەند سەد زمان و زاراوە) کە خەڵکانی ڕەگەزی بانتوو قسەی پێدەکەن.

**بانجو** / bānco، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* بانجۆ؛ ئامرازێکی مووسیقایە لە گیتار دەکا: **بانژو**

**باند** / bānd، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ١.

دەسەودایرە؛ دەسەوبەسە؛ دەسە؛ دەستە؛ چەند کەسێ کە بۆ ئامانج و مەبەستی دیاریکراو (زۆرتر نارەوا)، بە شێوەی قاچاخی پێکهاتوون ‹باند تبهکاران: دەسەودایرەی خراوکاران› ٢. بوار؛ هێڵ؛ هەرکام لە ڕێگاگەلی هاوشانی شەقام و جادە کە بە شوور، هێڵی سپی یا هەرشتیتر لە یەکدی جیاکراونەتەوە ‹باند فرودگاه: هێڵی فڕۆکەخانە› ٣. گوشک؛ گووسک؛ باند؛ پارچەی باریکی تەنک بۆ پێچانی برین ٤. شەپۆل؛ شەپۆلی ڕادیۆ ‹باند کوتاه: شەپۆلی کورت› ٥. باند؛ بلاوکەرەوە لە ئامێری دەنگیدا ‹رادیو دو باند: ڕادیۆی دوو باند›.

**بانداژ** / bāndāž، ـها/: [فرانسوی]/اسم. /پزشکی/ برین‌پێچی.

**باندبازی** / bāndbāzi، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. دەسەودایرە نانەوە؛ دەسە و بەسە سازکردن.

**باندپیچی** / bāndpîčî، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. برین‌پێچی؛ کار یان ڕەوتی بەستن؛ داپێچان؛ پێچانەوەی شوێنی برین بە پارچەی تایبەتی.

**باندرل** / bānd(o)rol، ـها/: [فرانسوی]/اسم. باندرۆل: ١. کاغەزێک کە دوای بازڕەسی دەوڵەت بۆ شتێک دەردەچێ ٢. پارچە کاغەزێک کە بۆ ناساندنی شتێک لێی دەدرێ.

**بانژو** / bānjo/: [فرانسوی] ☜ **بانجو**

**بانک** / bānk, bāng، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ١. چوانگە؛ بانق؛ بانک؛ شوێنی داوستەوی پوول و پارە ٢. مەکۆ؛ دامەزراوە یا ناوەندێک بۆ هەڵگرتنی شتومەک، تا ئەگەر پێویست بوو بدرێتە داواکاران ‹بانک اطلاعات: مەکۆی زانیاری›.

▣ **بانک استقراضی** ☜ **بانک رهنی**

**بانک اطلاعات:** مەکۆی زانیاری؛ دامەزراوە یان بەشێ لە دامەزراوەیێک بۆ کۆ کردنەوە، لێکدانەوە، هەڵگرتن و نیشاندانی زانیاریگەلی پێویستی خەڵک.

**بانک بازرگانی:** بانکی بازرگانی؛ ئەو بانگە کار و باری بازرگانی و ئابووری لە بواری پارە و دراودا دەکات (وەکوو سەندن و فرۆشتنی دراوی بیانی و...).

**بانک بین‌المللی:** بانکی نێونەتەوەیی؛ بانکێ کە بە کۆی سامانی چەن دەوڵەت پێکهاتووە.

**بانک تعاونی:** بانکی هاویاری؛ بانکی زبارەیی؛ بانکێ کە بۆ دابین کردنی پارە بۆ بنکەگەلی هاویاری کار دەکات.

**بانک خصوصی:** بانکی تایبەتی؛ بانکێ کە سامانەکەی هی یەک یان چەن کەس بێ.

**بانک خون:** بانکی خوێن؛ دامەزراوە یان بەشێ لە دامەزراوەی دەرمانی بۆ کۆکردنەوە و هەڵگرتنی خوێن و بەرهەمگەلی بۆ نەخۆشان.

**بانک دولتی:** بانکی دەوڵەتی؛ بانگێ کە سامان و بەڕێوەبردنی لە دەستی دەوڵەتدایە.

**بانک رهنی:** بانکی بارمتە؛ بانگی بارمتەگری؛ بانکێ کە بە بارمتەگرتنی ملک، وام دەداتە خاوەن ملک: **بانک استقراضی**

**بانک صادرات و واردات:** بانکی هەنارده و هاتە. هەروەها: **بانک صنعتی؛ بانک کشاورزی**

**بانک کارگشایی:** چوانگەی فریاڕەسی؛ بانقێ کە بە گلدانەوەی شتانی بایەخدار (وەک زێڕ و زیو ڕایەخ) وام ئەدا بە خاوەنەکانی.

**بانک مرکزی:** بانکی ناوەندی؛ بانکی نەتەوەیی؛ بانکی دەوڵەتی کە کاری ڕێک خستن و جێبەجێ کردنی کار و باری بانکی و پووڵی وڵات لە ئەستۆی دایە و پارە لە چاپ ئەدا.

**بانکداری** / bānkdārî، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. بانکداری؛ کار و ڕەوتی بەڕێوە بردنی کار و باری بانک. هەروەها: **بانکدار**.

**بانک‌زنی** / bānkzanî، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. بانکبڕی؛ کار و ڕەوتی دزینی پارە لە بانک.

**بانکە** / bānke، ـها/: [روسی]/اسم. پەرۆش؛ هەوانە؛ بەسوە؛ دەفری دەمهەراوی سەردار بۆ ڕاگرتنی چێشت.

**بانکی**[1] / bānkî، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کارمەندی چوانگە؛ کارگێڕی بانک.

**بانکی**[2]: صفت. بانکی؛ بانقی؛ پێوەندیدار یان سەر بە بانق ‹فعالیت بانکی: چالاکی بانکی›.

**بانگ** / bāng/: /اسم. [ادبی] ۱. هەرا؛ بانگ؛ ونگ؛ قوو؛ قوولە؛ قاو؛ قوویلە؛ قوولا؛ قیڕە؛ گازی؛ چرە؛ مرۆش؛ بەدەنگ قەو هەرا لێ کردن ‹روزی به غرور جوانی بانگ بر مادر زدم: ڕۆژێک لە بەر تەمی لاوی هەرام کردە سەر دایکم› ۲. دەنگ؛ قاڵ؛ فزە؛ ورت؛ ورتە ‹از کسی بانگ برنخاست: دەنگ لە کەسێکەوە نەهات›.

▣ **بانگ برآوردن:** هەرا کردن؛ قاوکردن؛ دەنگ بەرزکردنەوە.

**بانگ زدن:** قاوکردن؛ بانگ کردن؛ هاوار کردن؛ چرین.

**بانمک** / bānamak/: صفت. [مجازی] مەکین؛ خوێن شیرین؛ ئێسک‌سووک؛ ڕەزاسووک؛ بەدڵاچوو؛ خۆش؛ لەبەردڵان ‹دخترک خوشگل نیست اما بانمک است: کچۆلەکە جوان نیە، بەڵام مەکینە›.

**بانو** / bānû، ـان/: /اسم. کەیوانوو؛ خات؛ خاد؛ خادێ؛ خاتێ؛ ژنی بەڕێز؛ نازناوی ڕێزلێنان بۆ ژنێ کە شووی کردووە.

**بانی** / bānî، ـان/: [عربی]/اسم. ۱. سازەر؛ دانەر؛ دامەزرێنەر؛ بنیاتنەر؛ کەسێ کە بەناییک چێ‌دەکات ‹آزاد بانی این مدرسه است: ئازاد دانەری ئەم فێرگەیە› ۲. هاندەر؛ هۆکار؛ کەسێ کە ببێتە هۆی جێبەجێ بوونی کارێک ‹او بانی تحصیلم شد: هاندەری خوێندنم ئەو بوو›.

▣ **بانی خیر:** چاکەکار؛ خێرخواز؛ کەسێ کە کاری خێر دەکات ‹چند نفر بانی‌خیر این درمانگاه را ساختند: چەند چاکەکار ئەم نەخۆشخانەیانە دروست‌کرد›.

**باور** / bāvar، ـها/: /اسم. بڕوا؛ باوەڕی؛ باوەڕ؛ باوەر: ۱. بیر و باوەڕ؛ هەمەت؛ متمانە؛ ئاوەر؛ کۆمەڵەی بڕواگەلێ کە لە کۆمەڵگایەکدا وەرگیراون ‹به باور بسیاری از مردم اگر قورباغه بخواند، باران می‌آید: بە بڕوای زۆرێک لە خەڵکی ئەگەر قرپۆک بقۆڕێنێ، باران دەبارێ› ۲. وەرگرتنی چەمکێ یان دیاردە و ڕووداوێک لە مێشکدا بە نیشانەی ڕاستەقانی ‹باور داشتن: بڕوا هەبوون›.

▣ **باور کسی شدن/ آمدن:** [گفتاری] بڕوا کردن؛ باوەڕکردن؛ باوەڕکەردەی؛ بە ڕاست و دروست زانینی هەواڵێک ‹وقتی گفتم خانه خریده‌ام، باورش نشد: کاتێ وتم ماڵم کڕیوە، باوەڕی نەکرد›.

**به باوری رسیدن:** بە باوەڕێ گەیشتن؛ باوەڕ پێکردن ‹سرانجام به این باور رسید که آرام آدمی خیرخواه است: لە ئاکامدا بەم باوەڕە گەیشت کە ئارام مرۆیەکی خێرخوازە›.

**باوراندن** / bāvarāndan/: مصدر. متعدی. //**باوراندی:** باوەڕاندت؛ **می‌باورانی:** دەباوەڕێنی؛ **بباوران:** بباوەڕێنە// باوەڕاندن؛ سەلماندن: ۱.

هەڵپێچانی کەسێ بۆ وەرگرتنی قسەیەک ٢. لە کەسێکی تردا باوەڕێک خۆش کردن.
هەروەها: **باوراندنی**

**باورداشت** / bāvardāšt، ـها/: *اسم.* باوەڕی؛ بڕوایی؛ بیر و بڕوا؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەباوەڕ بوون ‹نباید باورداشت مردم را بازیچه قرار داد: نابێ بە باوەڕی خەڵک گاڵتە بکرێ›.

**باورکردنی** / bāvarkardanî/: *صفت.* جێبڕوا؛ بڕواپێکراو؛ شیاوی بڕوا پێهێنان.
هەروەها: **باورنکردنی**

**باه** / bāh/: [عربی] *اسم.* [ادبی] با: ١. تێکەڵاوی جنسی ٢. جەوهەری جنسی؛ هێزی با.

**باهم** / bāham/: *قید.* پێکەوە؛ پێکڕا؛ تێکڕا؛ لەڵیەک؛ هەڤڕا؛ بە یۆوە؛ وەڵیەک؛ لەتەکیەک؛ تەڤ؛ هەڤ؛ هەمڕا؛ ڤێک؛ بەهەڤرە؛ هەڤوردن؛ واهەم؛ هەچا؛ هەدا؛ لەڤ؛ پێک؛ بە سەر یەکەوە؛ یۆوە؛ پێوە؛ وێکدا؛ وێڕای یەک؛ پێڕا؛ بەڤرا: ١. لەگەڵ یەک بوون ‹باهم رفتند: پێکەوە ڕۆیشتن› ٢. هەمبەر بە کەسی تر ‹باهم نمی‌سازند: پێکەوە ناسازن› ٣. *[مجازی]* لە لای یەک بوون ‹دیشب باهم بودیم: دوێشەو پێکەوە بوین›.

**باهمدیگر** / bāhamdîgar/: *قید.* بەیەکەوە؛ پێوەرە؛ پێکەوە: ١. لەگەڵ یەکتریدا ‹باهمدیگر درگیری لفظی داشتند: بەیەکەوە دەمەقاڵەیان بوو› ٢. *[ادبی]* بە یەکترین؛ بەیەکەوە؛ پێکڕا ‹باهمدیگر گفتند: بەیەکەوە وتیان›.

**باهوش** / bāhûš/: *صفت.* هۆشیار؛ وشیار؛ شیار؛ وریا؛ بەهۆش؛ بە بیر و هۆش؛ بیرا؛ بیرتیژ؛ زەین ڕوون؛ زرەنگ؛ زرینگ؛ زیرەک؛ زیت؛ تیژ؛ هش‌ڤەکر؛ فیف.

**بایا** / bāyā/: *صفت.* *[ادبی]* پێویست؛ پێداویست؛ پێدڤی.

**بایائی** / bāyā'î/ ☜ **بایایی**

**بایایی** /bāyāyî/: *اسم.* *[ادبی]* پێویستی؛ پێداویستی: **بایائی**

**بای‌بای** / bāybāy/: [انگلیسی] *دعا.* خواحافیز؛ خوداحافیز؛ خوات لە گەڵ؛ خوات چنی؛ بەدۆعا.
⊡ **بای‌بای کردن:** خواحافیزی کردن.

**بایت** / bāyt/: [انگلیسی] *اسم.* بایت؛ بچووکترین تیپی یەکەی زانیاریگەلی کەمپیوتەر، بەرامبەر بە هەشت بیت.

**باید** / bāyad/: *قید.* دەبێ؛ ئەوێ؛ ئەشێ؛ پێویستە؛ گەرە؛ گەرەک؛ پێویستە؛ گانی؛ گۆنی؛ دێ؛ دڤیت؛ دڤی؛ مشۆ؛ مشیۆ؛ مەبۆ؛ دڤێت؛ بایەت؛ فەرمانی پێک هاتن

**بایدوشاید** / bāyad-o-šāyad/: *قید.* ئەشێ؛ پێویست؛ زەروور؛ بە شێوەیەک کە دەبێ وابێ ‹چنانکه باید و شاید درس نمی‌خواند: ئەو جۆرەی ئەشی دەرس ناخوێنێ›.

**بایر** / bāyer/: *صفت.* وشکە؛ بایر؛ بەیار؛ بەیر؛ بۆرە؛ بەون؛ بوور؛ بەوروو؛ زەمینی نەکێڵدراو: **بائر**

**بایست** / bāyest/: *قید.* ئەبێ؛ دەبێ؛ پێوستە؛ ئەشێ؛ مشۆ؛ بایەت.

**بایستگی** / bāyestegî/: *اسم.* پێویستی؛ بە شێوەیەک کە دەبێ وەها بێ.

**بایستن** / bāyestan/: *مصدر. لازم.* // **بایستی:** دەشێ؛ **می‌بایست:** مەشیا؛ **باید:** ئەشێ// ١. بوان؛ مشیەی؛ پێویست بوون ٢. شیان؛ شیاو بوون ❋ **باییدن** (سەرنج: «بایستن» و «باییدن»، ئەوڕۆکە لە زمانی فارسیدا زۆر باو نیە و تەنیا «باید» و «بایست» وەکوو ئاوەڵکار و بۆ پێداگری کار و کردار دەگوترێ).
■ صفت مفعولی: **بایسته** (شیاو)

**بایسته** / bāyeste/: *صفت.* پێویست؛ ناچار؛ شیاو. هەروەها: **بایسته بودن**

**بایستی** / bāyesti, bāya- /: *قید.* دەبوا؛ دەبا؛ ئەبوا؛ دەبوایە؛ ئەشیا؛ مشیا؛ مەشیا؛ مەشیایە؛ مشیایا؛ پێویست لە کاتی ڕابردوودا ‹بایستی می‌رفتم: دەبوا بچووبام›.

**بایع** / bāye' /: [عربی]*اسم. [حقوق]* فرۆشەر؛ فرۆشیار؛ فرۆشندە.

**بایکوت** / bāykot /: [انگلیسی]*اسم.* بایکوت؛ کار و ڕەوتی تەرەکردن؛ پشت تێکردنی گشتی سەبارەت بە تاکە کەسێک یان کارێک.

**بایگان** / bāygān، ـها؛ ـان/: *اسم.* بایەگان؛ ئارشیڤیست؛ ئەوەی کاری بایگانی دەکا.

**بایگانی** / bāygānî، ـها/: *اسم.* بایەگانی: ١. کار یان ڕەوتی پاراستن و ئاگەداری کردن لە نامە و بەڵگەگەل ٢. جێیەک کە نامە و بەڵگەگەلی تێدا ڕیزبەندی دەکرێن و هەڵدەگیردرێن: **آرشیو**

**بایدن** / bāyîdan / ☜ **بایِستَن: بائیدن**

**ببر** / babr، ـها؛ ـان/: *اسم.* بەور؛ بەبر؛ جانەوەرێکی گەورەی گۆشتخۆرە پێستی ڕەش و زەردی خێرخێرە و زیاتر شەوان ڕاو دەکا.

**ببعی** / baba' î /: *اسم.* ١. *[ـها] [کودکانه]* بەعە؛ مەڕ؛ عاعالێ؛ وەرلێ؛ بەرخ یا کاژیلە ٢. *[مجازی]* ساویلکە؛ سافیلکە؛ گۆلێ؛ خولەپەڕۆ؛ مرۆی کەمئاوەز و هیچ لێنەهاتوو.

**بپا** / bepā، ـها/: *اسم. [گفتاری]* نیگابان؛ چاودێر ‹حالا دیگە برایم بپا گذاشته‌ای؟!: ئێستا ئیتر نیگابانت بۆ داناوم؟!›.

**بپا** / beppā، ـها/: *صوت. [گفتاری]* وریابە؛ ئاگاتبێ؛ هۆشتبێ؛ لادە؛ وشەی خەبەر کردن ‹بپا نیفتی!: وریابە نەکەوی!›.

**بت** / bot، ـها/: *اسم.* بت؛ بوت؛ بتە؛ پت: ١. *ـان/* پەیکەری ئینسان، داعبا یان گیایەک کە نیشانەی هێزی ئاسمانی و شیاوی پێدا هەڵگوتن بێت ٢. *[مجازی]* کەسێ کە زۆر خۆشەویستە و پێی هەڵدەگوترێ ‹شده بت جوانان: بووەتە بتی لاوان›.

**بتا** / betā /: [یونانی]*اسم.* بێتا؛ ناوی دووهەمین پیتی یوونانی (β).

**بتانه** / batāne /: [از عربی]*اسم.* بەتانە؛ تێکەڵاوی خاکی سپی و ڕۆنی بەزرەک کە وەکوو هەویرێکی لێ دێت، درزی شیشەی پێ دەگرن و دیواری پێ ساف دەکەن: **بطانه؛ بتونه**

**بتانه‌کاری** / batānekārî، ـها/: [از عربی/ فارسی]*اسم.* بەتانەکاری؛ گرتنی درزی شیشە و لووس‌کردنی دیوار بە بەتانە: **بتونه‌کاری**

**بت‌پرست** / botparast، ـها؛ ـان/: *اسم.* بت‌پەرەست؛ بت‌پەرس؛ ئەو کەسەی بت و شتی دەسکرد دەپەرەستێ. هەروەها: **بت‌پرستی**

**بت‌تراش** / bot.tarāš، ـها؛ ـان/: *اسم.* بت‌تاش؛ بت‌تەراش؛ بت‌ساز: **بتگر؛ بت‌ساز**

**بتخانه** / botxāne، ـها/: *اسم.* بتخانە؛ شوێنی بتان و پەرستنیان: **بتکده**

**بتر** / batar /: *صفت. [مخفف]* خراپتر؛ خراتر؛ خراوتر؛ بەتر؛ بەتەر.

**بت‌ساز** / botsāz / ☜ **بت‌تَراش**

**بت‌شکن** / botšekan، ـها؛ ـان/: *اسم.* بوت‌شکێن؛ بت‌شکێن: ١. ئەوەی کە بت دەشکێنێ و خراپی دەکا ٢. کەسێک بە سەرکەوتوانە لەگەڵ بت‌پەرەستیدا ملە دەکات.

**بتکده** / botkade / ☜ **بتخانه**

**بتگر** / botgar / ☜ **بت‌تَراش**

**بتن** / beton /: [فرانسوی]*اسم.* بیتون؛ تێکەڵی سیمان و ماسە و ئاو، کە دوای وشک بوونەوە وەکوو بەردی لێ‌دێ: **بتون**

⊡ بتن مسلح ☜ بتُن‌آرمه

**بتن‌آرمه** / betonārme, -'ārme /: [فرانسوی] /اسم. کۆنکریت؛ بیتونی بە میلەی ئاسنی قایم‌کراو: **بتون مُسلّح**

**بتن‌ریزی** / betonrîzî، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. بیتونرێژی (بۆ خانوو کردنەوە). هەروەها: **بتن‌ریز**

**بتنی** / betonî/: [فرانسوی] صفت. بیتونی؛ لە بیتون دروست‌کراو.

**بتولیسم** / botolîsm/: /اسم./ [پزشکی] بوتولیسم؛ مەسموومی بەهۆی خواردنی گۆشت و کونسیرڤی کۆنە و خراوبوو کە ڕشانەوە، دڵێشە، وشکی دەم و گەروو و پژمەی زۆر، لە نیشانەکانیەتی: **بُوتُولیسم**

**بتون** / beton/: [فرانسوی] ☜ **بتُن**

**بتونه** / batûne/: [از عربی] ☜ **بَتانه**

**بتونه‌کاری** / batûnekārî/: [از عربی/ فارسی] ☜ **بَتانه‌کاری**

**بتونیر** / betonyer، ـها/: [فرانسوی]/اسم. بیتونیر؛ ماشێنی دروست‌کردنی بیتون لە سیمان و ماسە و ئاو.

**بته** / botte، ـها/: /اسم./ [گفتاری] بنچک؛ پنچک؛ بنجک؛ بوتگ؛ دەوەن؛ دەوی؛ دەوەند؛ دەڤی؛ شخەڵ بەتایبەت هی دڕک و گیا.

**بته‌جقه** / botteceqqe، ـها/: [فارسی/ ترکی] /اسم. جوقە؛ وێنەیێک لە ڕووی سەڵوی شۆڕەوەبوو کە بە ڕووی پارچە و قاڵیدا دەری دێنن.

**ب. ث. ژ.** / be. se. je. /: [فرانسوی]/اسم./ [پزشکی] بێ.سێ.ژێ.؛ ناوی کورت‌کراوی واکسەنی دژی نەخۆشی سیل یان ئازارە باریکە.

**بثور** / busûr, bosûr، بثور؛ ـات/: [عربی]/اسم. پیزۆکە؛ زیپکە؛ جۆشی بان پێست.

**بج** / boc, bac/: /اسم./ [قدیمی] گەپە؛ ناودەم؛ دڵێ‌دەمی؛ ناوزار؛ ناوەوەی دەم.

**بجا** / becā/: صفت. بەجێ؛ لەجێ؛ بەجێگە؛ بەیاگێ؛ هاوە؛ قاف؛ ڕەوا؛ لە جێی‌خۆیدا؛ بە ڕێ و جێ ‹کار بجا: کاری بەجێ›.

⊡ **بجا آمدن**: /گفتاری/ بەجێ هاتن؛ هاتنەوە جێ.

**بجا آوردن**: /گفتاری/ ناسینەوە؛ بەجێ هێنان ‹مرا بجا نمی‌آوری؟: من ناناسیەوە؟›.

**بجای آوردن**: /ادبی/ بەجێ هێنان؛ جێبەجێ‌کردن؛ بەگا ئاردەی؛ ئەنجام دەی ‹وعده تو کردی او بجای آورد: تۆ بەڵێنت دا و ئەو بەجێی هێنا›.

**بجز** / becoz/ ☜ **جُز**

**بجول** / bocûl/ ☜ استخوان قاب، **استخوان**

**بچاپ ـ بچاپ** / bečāpbečāp/: [فارسی/ ترکی فارسی/ ترکی]/اسم./ [گفتاری] بڕفێن ـ بڕفێن؛ ڕفان ـ ڕفان؛ بڕفان ـ بڕفان؛ تاڵان و ماڵان؛ تاڵان و بڕۆ؛ پوور؛ تاڵان و تاڕان ‹این ثروت محصول بچاپ‌بچاپ دوره‌ی جنگ است: ئەم پووڵ و پارەیە بەرهەمی بڕفین‌بڕفینی سەردەمی شەڕە›.

**بچگانه**[1] / baččegāne/: صفت. منداڵانە؛ مناڵانە؛ مندارانە؛ زاوڵانە؛ زاروانە؛ بەچانە: ۱. پێوەندیدار یان سەبارەت بە منداڵ ‹لباس بچگانه: بەرگی منداڵانە› ۲. /مجازی/ ساوا؛ کرچ و کاڵ یان گەوجانە ‹فکر بچگانه: بیری منداڵانە›.

**بچگانه**[2]: قید. منداڵانە؛ مناڵانە؛ مندارانە؛ زاوڵانە؛ بەچانە؛ وەکوو منداڵان ‹بچگانه حرف نزن: منداڵانە قسە مەکە›.

**بچگی** / baččegî/: /اسم. مناڵی؛ منداڵی؛ زاوڵەیی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی مناڵ بوون ۲. /ـها/ ڕۆژگاری زارۆکی؛ سەردەمی منداڵی ۳. /مجازی/ هەڵس‌وکەوتی سووکانە و نابەجێ و بە دوور لە چاوەڕوانی. هەروەها: **بچگی کردن**

**بچه** / bačče، ـها؛ ـگان/:/اسم. ١. بەچکە؛ وەچگە؛ واجگە؛ بەچوە؛ بێچوو؛ بەچە؛ گیانداریک کە هێشتا گەورە یان باڵغ نەبووبێ ٢. ڕۆڵە؛ زارۆک؛ زاوڵە؛ زارۆڵە؛ زارۆ؛ فرزەن؛ وەچە؛ منداڵ؛ مناڵ؛ پسانگ؛ بەچگ؛ بێچووی مرۆ؛ منداڵی مرۆ ‹چند تا بچه داری؟: چەند منداڵت هەیە؟› ٣. مناڵ؛ منداڵ؛ مندار؛ زارۆک؛ زاوڵە؛ زاری؛ مرۆی تەمەن کەمتر لە سێزدە ساڵ ٤. خەڵک؛ دانیشتوو یان خەڵکی شوێنێک ‹بچه‌محل؛ بچه‌ی تهران: خەڵکی گەڕەک؛ خەڵکی تاران› ٥. هاوکار؛ هەڤکار؛ هاوڕێ؛ هەڤگوڕ؛ کەسانی هاوتەراز تایبەت بە گرۆ یان ڕێکخراوەیەک؛ هاوکاران ‹بچه‌های اداره: هاوکارانی مەزرینگە›.

▣ **بچه‌ی اول**: نۆزک؛ نۆزگە؛ نۆسکە؛ نۆزکە؛ نۆڵەم؛ نۆبەر؛ نۆبەرە؛ بەرەزا؛ نووچەو؛ نخری؛ نخوری؛ هەوەڵ مناڵ.

**بچه‌ی تەتغاری**: [کنایی] ئاخرچۆڕ؛ نۆمەمڵە؛ ولکلە؛ چکۆلەترین منالی ماڵ.

**بچه‌ی سرراهی**: منداڵی سەرەڕێ؛ زارۆی ناوڕێ؛ منداڵی دانراو کە دای و بابی ناسراو نین.

**بچه‌ی کوچک/ نوجوان**: چوکری؛ لاوژۆک؛ لاوژۆکە؛ دەمرووت.

▣ **بچه انداختن**: بەر خستن؛ بەرفڕێدان؛ بەراوتین؛ لەم وسەی؛ لەبار چوون؛ بێچووی مردوو هێنان؛ بێچوو بە مردوو هاویشتن؛ مناڵ زیان‌کردن.

**بچه آوردن**: زک‌کردن؛ مناڵ بوون؛ بێچوو هێنان؛ لەمەکەردەی؛ زۆمە کەردەی؛ زایین.

**بچه پس انداختن**: [تعریض] مناڵ خستنەوە؛ زاوڵە وسەیوە؛ بەسووکی و تیزەوە باسی زک‌وزا کردن.

**بچه را گرفتن**: منداڵ‌گرتنەوە؛ یارمەتی دانی دایک لە کاتی منداڵ بووندا و زارۆکەی دە باوەش‌گرتن ‹همه‌ی بچه‌های ما را او گرفته بود: هەموو منداڵانی ئێمە، ئەو گرتبوونیەوە›.

**بچه‌کردن**: زان؛ زایین؛ زەی: ١. بەچکە کردن؛ زاوزێ‌کردن ٢. [گفتاری] زۆر بوون؛ پەرەسەندن؛ زاف‌کەردەی ‹پولهایش بچه کردند: پارەکانی زاون›.

**بچه‌گذاشتن**: بەچکەکردن؛ تەرەکین؛ زک کردنی گیانلەبەر.

**بچه‌باز** / baččebāz، ـها؛ ـان/: صفت. لووسکەباز؛ مناڵباز؛ بەچەباز؛ نێرباز.

**بچه‌بازی** / baččebāzî، ـها/:/اسم. ١. کایەکلێ؛ منداڵبازی؛ مەچەڵ؛ گاڵتە؛ گۆنگەر؛ گۆنگل؛ گۆنگەڵ؛ یاری منداڵانە ‹آقا! سیاست که بچه‌بازی نیست: کاکە! ڕامیاری خۆ کایەکلێ نییە›. ٢. لووسکەبازی؛ بەچەبازی؛ نێربازی.

**بچه‌دار** / baččedār، ـها؛ ـان/: صفت. منداڵدار؛ مناڵدار؛ زاوڵەدار؛ خودان زارۆ.

**بچه‌داری** / baččedārî، ـها/:/اسم. منداڵداری؛ مناڵداری؛ زاوڵەداری؛ ڕاهێنان و بارهێنانی منداڵ.

**بچه‌دان** / baččedān/:/اسم. [گفتاری] پزدان؛ زامار؛ بێچوودان؛ پزان؛ یاوەرە؛ هەڵپەز؛ تۆڵدان؛ منداڵدان؛ مناڵدان؛ مالبچویک؛ هەماز؛ هاوباز؛ بز؛ پاور؛ پزو؛ پزڵی؛ پڕزانک؛ زایەدان؛ بەچەدانی؛ گللک.

**بچه‌دزد** / baččedozd، ـها؛ ـان/:/اسم. مناڵدز؛ کەسێ کە مناڵان دەدزێت. هەروەها: **بچه‌دزدی**

**بچه‌دوست** / baččedûst، ـها؛ ـان/: صفت. منداڵخواز؛ زارۆڵەواز؛ مناڵخوەشەویس؛ زاوڵەوەشەویس (بۆ نێر)؛ زاوڵەوەشەویسە (بۆ مێ)؛ بەتایبەت خوازیاری منداڵی زۆر.

**بچـەزا** / baččezā. ـها؛ ـیان/: *صفت.* زیننـەزا؛ زیندەزا؛ بێچووزا؛ بەچکەزا.

**بچـــەسـال** / baččesāl. ـهـا؛ ـان/: *صـفت.* *[گفتاری]* کـەم تـەمـەن؛ منـاڵسـاڵ؛ منـاڵکـار؛ زاوڵەکار ‹داماد بچەسال است: زاوا مناڵکارە›.

**بچـەسر کە** / baččeserke. ـها/: *اسم.* *[شیمی]* گیانـداری وردیلانـەی هـۆی بوونـە سـرکەی ئەلکول.

**بچـەقـنـداقی** / baččeqondāqî. ـها/: [فارسـی/ ترکی] *اسم.* کۆرپـە؛ ساوا؛ منالـی بابۆڵـە؛ زارۆی بەر مەمکان کە قوماتەی دەپێچن.

**بچـەگـدا** / baččegedā. ـها؛ ـیان/: *اسم.* ١. دەرۆزەکـەری منـداڵ؛ منداڵـێ کـە سـواڵ دەکا ٢. بـەچکـە سواڵـکەر؛ منداڵـێ کـە بـابی سواڵکەر بێ.

**بچه محصل** / baččemohassel/: [فارسی/ عربی] ☜ **بچەمدرسه**

**بچــەمحــل** / baččemahal. ـهـا/: [فارســی/ عربی] *اسم.* *[گفتاری]* هاوگـەڕەک ‹آزاد بچـەمحـل ماست: ئازاد هاوگەڕەکی ئێمەیە›.

**بچــەمدرســه** / baččemadrese. ـها/: [فارسـی/ عربی] *اسم.* مەدرەسەیی؛ قوتابی؛ منداڵێ کـە لـە قوتابخانەدا دەرس ئەخوێنێت: **بچەمحصل**

**بچــەمکتبــی** / baččemaktabî. ـها/: [فارسـی/ عربی] *اسم.* *[قدیمی]* مەدرەسەیی؛ قوتابی.

**بچــەننــه** / baččenane. ـها/: *صـفت.* *[کنـایی]* ترسـەنـۆک؛ لـێنـەهـاتوو؛ تـەرسـەزاڵ؛ ترسەزاور؛ ترسنۆک؛ حیزەڵە؛ قەڵسەمێرە.

**بحار** / behār/: [عربی] جمعِ ☜ **بَحر**

**بحبوحـه** / bohbûhe/: [عربـی] *اسم.* جـەنگـە؛ تـاف؛ هــەڕەت؛ هــەڕەمــە؛ قرچــە؛ گــەرمــە؛ نـاوەڕاسـت یـان لـە نێـوان کـار یـان ڕەوتێکـدا ‹بحبوحەی جنگ: گەرمەی شەڕ›.

**بحــث** / bahs/: [عربـی] *اسم.* بـاس؛ لـێدوان؛ بەحس؛ دوان؛ جـەڕ؛ زنجـیرەی پـەیوەسـتەی وتووێـژان بـە مـەبـەسـتی تـاوتوێ کـردنی دروسـتی یـان نادروسـتی یـەک یـان چـەنـد مەبەستێک.

▣ **بحـث آزاد**: باسـی هـەمـووانی؛ باسـێ کـە هـەمـوو کـەسـێک ڕێـی هـەیـە تێیـدا بەشداری بکات.

**بحـث رسـمی**: باسـی ڕەسمـی؛ باسـێ کـە بابـەت و بـەشـدارەکـانی لـە پێشدا دیـاری کراون.

**بحــث و فحــص** / bahs-o-fahs/: [عربـی] *اسم.* بــاس و خــواس؛ قــسە و بــاس؛ بــاس و لێکدانەوە.

**بحــر** / bahr/: [عربـی] *اسـم.* ١. /بحـار/ زەریـا؛ دەریـا؛ زێ ‹بحـر احمـر: زەریـای ئـەحمـەر› ٢. /ها؛ بُحور/ هـەڤـدەن؛ بـەحـر؛ کێـشی شـیعری فارسی و عەرەبی.

▣ **بحر طویـل**: جـۆرێ شـیعری کلاسـیک کـە لـە ١٦ تـا ٣٢ جـار فـەعیلاتـون پێـکدێ و زۆرتـر بـۆ مـەبـەسـتی گاڵـتە و تـەنـز و داشۆڕان (هەجو) بەکار دەچێ.

▣ **توی/ در بحر چیزی بودن/ رفتن** ☜ **تو**[٢]

**بحرالعلــوم** / bahrol'olûm/: [عربـی] *صـفت.* *[مجازی]* زۆرزان؛ پیتۆڵ؛ دەریای زانست.

**بحـران** / bohrān. ـها/: [عربـی] *اسم.* قـەیـران؛ ئاگـا؛ بـوحران: ١. ئـەو پـەڕی کـارەڕەهاتێـک کـە بـە دوویـدا گۆڕانکـاری دەبـێ ‹بحـران سیاسـی: قـەیرانـی ڕامیـاری› ٢. جـەنگـەی زۆرگـرتنی نـەخۆشـی کـە بـە شـوێنیدا یـان چابوونەوە یان مەرگە.

**بحرانـی** / bohrānî/: [عربـی] *صفت.* قـەیـرانی؛ بوحرانی؛ ناسکەوبووگ؛ خەتەری.

**بحــری**[١] / bahrî. ـها/: [عربـی] *اسم.* سـیکوژ؛ پەلەوەرێک لـە تـیرەی شـەهـێن، بـاڵ درێـژ و دندووک تیژ، جووچکە باریـک، تیژفـڕ، سـەلـک ڕەش و پــشت خۆڵــەمێــشی، کــە زۆرتــر

پەلەوەران ڕاو دەکا.

**بحری** [2] /ـها/: [عربی] صفت. [ادبی] زەریـایی؛ دەریایی؛ زێیی.

**بحق** / behaq(q)/ : [عربی] ☜ **بەحق**

**بحمـــدالله** / behamdellā(h)/: [عربـــی] دعـــا. شـــوکور بـــۆ خـــودا؛ خواشـــوکر؛ لـەســـایەی خوداوە ‹بحمدالله کار و بـارم بـد نیست: شـوکور بـۆ خودا کارم خەراپ نیە›.

**بحور** / bohûr/: [عربی] جمعِ ☜ **بَحر**

**بخـــار** / boxār/: [عربـی]/اسـم. ١. /ــهـا؛ ـات؛ اَبخِـره/ هـەڵـم؛ هـەڵـمی؛ هـولم؛ هلـم؛ گـولم؛ هـەڵـمە؛ هـاڵاو؛ هـەفـار؛ هـەوە؛ هـەپ؛ بـۆق؛ بـۆخ؛ بـۆغ؛ کـەڵـدومان؛ مـژی گـەرمـا ٢. [گفتـاری] بڕشـت؛ قـەوەت؛ تابـشت؛ بڕشـت؛ توانـا؛ تاقـەت؛ هێـز؛ هـازی؛ دەسـت و دوو؛ بـڕس ‹آدم ایـن قـدر بـی‌بخـار!؟: مـرۆی ئـەمـەنـدە بـێ‌دەسـت و دوو!؟› ٣. گـاز؛ شـێوازی جگـە لـە تراو (مایع) و تەن (جامد) بۆ هەر شتێ.

▣ **بخـار معـده**: [کنـایی] تێـر و مـڕی؛ تـەزەلی؛ تێـر و تـەسـەلی؛ سێر و پـەڕی؛ تێـری و بێ‌حاڵـی لـە بـەر زۆر خـواردن ‹حرفهـای آقـا بیشتر از بخار معده بـود: قسەکـانی ئاغـا زیـاتر لـە بەر تیر و مری بوو›.

**اسب بخار** ☜ **اسب**

**دیگ بخار** ☜ **دیگ**

▣ **بخـار داشـتن**: [کنـایی] بڕشـت هـەبـوون؛ بڕسـت هـەبـوون؛ هـاز بیـەی؛ دەسـت و دوو بوون؛ بەقەوەت بوون؛ توانـا بـوون ‹بخـار ایـن کارها را ندارد: بڕشتی ئەم کارانەی نیە›.

**بخار شدن**: بوونە هەڵـم/ هـاڵاو؛ وەک هـەڵـم لێهاتن. هەروەها: **بخار کردن**

**بخـــارپز** [1] / boxārpaz، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] اسم. کـەرەسـەیێـک کـە بـە هـەڵـم چێـشت دروست دەکا.

**بخـارپز** [2]: صفت. کـولاو بـە هـەڵـماو؛ بـە بـۆق کولاو.

**بخارســنج** / boxārsanc، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] اسم. هـاڵاوپێو؛ ئـامرازی پێـوانی تـەوژمـی بـۆق و هالاو.

**بخـــاری** [1] / boxārî، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. سـۆمپا؛ سـۆپا؛ زۆمپـا؛ زۆپـا؛ زۆپـە؛ سـۆبە؛ سـۆپە؛ سومیە؛ ڕۆژینـگ؛ لـووەجـن؛ کـوورە؛ بخێـری؛ مغاری؛ کوورەی ئاگر بۆ گەرم‌کردنی ژوور.

▣ **بخـاری برقـی**: سـۆمپا/کـوورەی کـارەبـایی؛ سۆپای بەرقی.

**بخـاری دسـتی**: سـۆمپا/کـوورەی دەسـتی؛ زۆپـــەیێـــک کـــە دەگۆزرێتـــەوە و لوولـــە سۆپای نیە.

**بخـاری دیـواری**: کۆمـاج؛ مـوغێری؛ کوانـێ؛ ئـــاگردان؛کوانووی نـــاو دیـــوار؛ جـــۆرە سۆمپایەک کە بـە ئـاجۆر یـان بـەرد لـە نێـو دیـواری هـۆدەی ماڵـدا چـێ دەکـرێ و گەرمای لە سـووتاندنی چیلـە و زوغـاڵ یـان گاز پێک دێ.

**بخـــاری زغـــالی**: کـــوورەی زوغاڵـــی؛ سـۆمپایەکـی ئاسـنی کـە لوولـەی هـەیـە و زۆرتـر زوخـاڵ یـان زوخاڵـە بـەردینـەی تـێ‌دەسـووتێنن. هـەروەهـا: **بخـاری گـازی؛ بخاری نفتی؛ بخاری هیزمی**

**بخاری** [2]: صفت. ١. خـەڵـکی شـاری بوخـارا لـە ئوزبـەکیـستان ٢. پێـوەندیـدار بـەو شـارەوە ٣. هەڵمی؛ هـەڵـمینە؛ ئـەوەی بـە هێـزی هـەڵـم کار دەکا.

**بخـــاری‌ســـاز** / boxārîsāz، ـهـا؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی]/اسم. سۆبەسـاز؛ کـوورەسـاز؛ زۆپـاچی؛ کەسـێ کـە کـاری سـۆپا خـۆش کـردن و دروســـت‌کردنـــەوەی بێـــت. هـــەروەهـــا: **بخاری‌سازی**

**بخـــت** / baxt/:/اسـم. بـەخـت؛ تاڵـە؛ هـەدار؛ وەخـــت؛ هـــات؛ هاتـــە؛ هـــات و وات؛ ڕەشـــنە؛

کابەشاک: ۱. بار و دۆخی لەناکاو و چاوەڕواننەکراو لە ژیانی کەسێکدا ‹بخت بد: بەختی ڕەش› ۲. ‌ـهات/ فریشته؛ بار و دۆخ یان ڕووداوەگەلی باش لە ژیانـدا؛ شانس ‹بخت بە او روی آورد: بەخت ڕووی تێ‌کرد›.

▣ **بخت بلند/ بیدار:** */کنایی/* بەختەوەری؛ بەختیاری؛ کامڕەوایی؛ هەداریاری.

**بخت خفته:** */کنایی/* بەختی خەوالوو؛ بەختی نووستوو؛ بێ‌بەختی؛ بەختی ڕەش؛ چارەڕەشی؛ ڕۆژەڕەشی؛ بەخت کوێری؛ بەختی هەڵگەڕاو؛ بەختی بەسراو؛ کلۆڵی؛ بەختی دوژمن.

**خانەی بخت** ☜ **خانه**

▣ **بخت بە در خانەی کسی آمدن:** */کنایی/* بەخت ڕووکردنە کەسێ؛ بەخت هاتنە ڕێی کەسێک؛ بەخت هێنان؛ ڕێکەوتی پێکەوت بۆ کەسێک چەلان؛ هەل بۆ کەسێک ڕەخسان: **بخت بە کسی رو کردن**

**بخت بە کسی رو کردن** ☜ **بخت بە در خانەی کسی آمدن**

**بخت خود را آزمودن:** */کنایی/* بەختی خۆ ئەزموون؛ شانسی خۆ تاقی‌کردنەوە؛ هات و باتی خۆ ئەزموون؛ دەست‌پێ‌کردنی کارێک کە بە بارێکدا نەڕوا و ئاکامی نادیار بێ.

**بخت کسی باز شدن:** */کنایی/* بەختی کەسێ بەر بوون؛ زەماوەن‌کردن.

**بخت کسی را باز کردن:** */کنایی/* کۆست خواستن؛ بەخت بەردان؛ بەخت تەخت کردن؛ بە نزا و مزا بە شوودانی کچ. بەرانبەر: **بخت کسی را بستن**

**بخت کسی را بستن:** */کنایی/* بەخت هەڵگەڕاندن؛ بەخت کوێرەوەکردن؛ کۆست بەستن بە گازە و جادوو، بۆ بەرهەڵستی لە شووکردنی کچێک. بەرانبەر: **بخت کسی را باز کردن**

**بخت یاری کردن:** */کنایی/* هات باش هێنان؛ بەخت بە دەمەوە هاتن؛ بەختەوەر بوون.

**بە بخت خود پشت کردن** ☜ **بە بخت خود لگد/ پشت پا زدن**

**بە بخت خود لگد/ پشت پا زدن:** */کنایی/* پشت‌کردن لە بەختی خۆ؛ لەقە لە بەخت خۆدان؛ هەل بە دەرفەت نەزانین: **بە بخت خود پشت کردن**

**بە خانەی بخت رفتن** ☜ **خانه**

**بخت‌آزمایی** / baxtāz(e)māyî، ـها/: *اسم.* ۱. بەخت‌ئەزموونی؛ بەخت‌ئازمایی؛ خۆت و بەختی؛ کۆمەڵە کار و ڕەهاتێک بۆ دابین کردن و فرۆشتنی پسووله و لاتاری و دەست نیشان کردنی بەرندە و دابەشکردنی خەلات ۲. */مجازی/* کار یان ڕەوتی دەس بردن بۆ کارێ کە سەرکەوتن و دواکەوتنی بە هەڵکەوت بێ.

**بختانه** / baxtāne/: *قید.* بەختانە؛ بەختانی؛ بەختەکی؛ هات و باتی؛ بە هەڵکەوت؛ خۆو بەختی؛ هەڕەمە؛ هاکۆ؛ گۆترە؛ گۆترەی؛ لەپڕی؛ کوت‌وپڕی؛ نەکاوی؛ بێ‌ئاگاداری پێشوو.

**بخت‌برگشته** / baxtbargašte، ـها؛ ـگان/: *صفت.* بەخت‌هەڵگەڕاو؛ بەخت‌نووستوو؛ بەخت‌ڕەش؛ چارەڕەش؛ بەدبەخت؛ ڕۆژڕەش؛ بەخت‌کوێر؛ بەخت‌بەسراو؛ چەرمەسەر؛ کلۆڵ؛ ناوچەوان قۆقز؛ ناوچەوان قەشقە؛ تووشی ناکامی یان ڕووداوی ناخۆش هاتوو.

**بختک** / baxtak/: *اسم.* شەوە؛ شەوگ؛ شەوێ: ۱. مۆتە؛ مۆتەکە؛ تاپۆ؛ تارمایی ۲. هەست بە خنکان و خەستانی زۆر لە خەودا کە خەوتوو بۆ خەلسانی هەوڵ بدا و

دەستی بە هیچ کوێ نەگا ٣. تاپۆیەک کە وەها هەستێک پێک بێنێت.

**بختە** / baxte/: اسم. پەروار؛ داوەستە؛ ئاژەڵی دابەستە.

**بختیار** / baxt(î)yār/: صفت. [ادبی] بەختیار؛ بەختەوەر؛ بەختدار؛ خۆشبەخت.

**بخر** / bexar/: اسم. [گفتاری] سێنەر؛ کڕیار؛ سانەر؛ سەنیار؛ بسێن؛ کەسێ کە لێی دەوەشێتەوە شتێک بسێنێ.

**بخرد** / bexrad، ـان/: صفت. [ادبی] ژیر؛ بەبیر؛ بیرمەند؛ ئاوەزمەند؛ بەئاوەز؛ مژیار. هەروەها: **بخردی**

**بخش** [1] / baxš، ـها/: اسم. بەش؛ پاژ؛ پشک: ١. گیهەڤ؛ ئەندازەیەکی دیاری نەکراو لە شتێک ‹بخشی از مردم: بەشێ لە خەڵک› ٢. بەشێک لە مەزرینگە کە کارێکی تایبەتی لە ئەستۆدایە ‹بخش تاریخ دانشکده: بەشی مێژووی زانکۆ› ٣. [ریاضی] دابەش؛ دابەشیەتی ٤. ناوچە؛ ناوان؛ کاڤار؛ سنجەق؛ شارۆچکە؛ گوندیلان؛ چەن دێ و شارەدێ کە شارۆکەوانێک پێی ڕادەگا و جەماوەر و ئاپۆرەی دەر لە شاری کەمتر لە ٣٠٠٠٠ و زۆرتر لە ١٢٠٠٠٠ کەس نیە ٥. بەشێک لە کتێبێک، یان نووسراوەیەک کە تا ڕادەیەک سەربەخۆیە ٦. پارچە؛ کوت؛ ناوچە؛ کوتێ لە شارێک کە چەشنێک یەکیەتی ئابووری و کۆمەڵایەتییان تێدایە ٧. چینێکی وەک یەک لە بنەماگەلی سەر بە کۆمەڵێک ‹بخش دولتی: بەشی دەوڵەتی› ٨. [قدیمی] چارەنووس.

◙ **بخش خصوصی**: بەشی تایبەتی؛ کۆمەڵەی کەسان و بنکەگەلێک کە کاری ئابووریان لە ژێر چاوەدێری دەوڵەتدا نیە. هەروەها: **بخش دولتی**

◙ **بخش کردن**: بەش کردن؛ دابەش کردن؛ بەش کەردەی. هەروەها: **بخش شدن**

**ـ بخش** [2]: پیواژە. ـدەر؛ بەخش؛ ـپێدەر ‹روشنایی‌بخش: ڕووناکیدەر›.

**بخشانیدن** / baxšā'îdan/ ☜ **بخشاییدن**

**بخشایش** / baxšāyeš/: اسم. بەخشایشت؛ لێبووری؛ بەخشێنەری؛ عەفوو؛ ویەردەی؛ نوخاف؛ کاری خۆش بوون لە سووچ و گونا.

**بخشاینده** / baxšāyande/: صفت. دەهندە؛ بەخشندە؛ بەخشێنەر؛ بەخشا؛ خاوەن لێهاتوویی یان هۆگرەتی بە بەخشین.

**بخشاییدن** / baxšāyîdan/ ☜ **بَخشودَن**: **بخشائیدن**

**بخش‌بر** / baxšbar/: اسم. دابەش‌بە؛ دابەش‌سەر ‹٣٠ بخش‌بر ٦ می‌شود ٥ : ٣٠ دابەش بە ٦، دەکاتە ٥›.

**بخش‌بندی** / baxšbandî/: اسم. پاژبەندی؛ بەشبەندی؛ کار یان ڕەوتی دابەش کردنی کۆمانەیەک بە بەشگەلێکی جیاواز.

**بخشدار** / baxšdār، ـها؛ ـان/: اسم. شارۆچکەوان؛ شارۆکەوان؛ بەخشدار؛ ناوچەدار؛ دەڤەردار؛ بالاترین پلەی کارگێڕی لە شارۆچکەیەکدا؛ نوێنەر و بەرپرسی دەوڵەت و وەزارەتی ناوخۆ لە شارۆچکەدا.

**بخشداری** / baxšdārî/: اسم. بەخشداری؛ ناوچەداری: ١. کاری بەخشدار ٢. ـها/ مەزرینگەیەک کە بەخشداری تێیدایە.

**بخشش** / baxšeš، ـها/: اسم. کار یان ڕەوتی بەخشین: ١. گیهەڤ؛ دانەک؛ بەخششت؛ بەشانەوە؛ بەخشایەتی؛ کار و ڕەوتی دانی شتێک بە خۆڕایی ‹هر چه داشت به این و آن بخشش می‌کرد: هەر چێکی بوو بە ئەم و ئەوی دەبەخشی› ٢. دەستندە؛ دەسەنە؛ ئەو شتەی کە بە خۆڕایی بدرێتە کەسێک ‹بخشش به خروار، حساب به دینار: بەخشین بە خەروار، حیساب بە دینار› ٣. لێبووردن؛

بـەخشایـشت؛ ویـەردەی؛ کـار یـان ڕەوتی چاوپۆشی کـردن لـە هـەڵـە و تـاوانی کـەسان ‹بخشش از بزرگـان اسـت: بـەخـشش بـۆ گەورەگەلە›.

⊡ **بخـشش داشـتن:** خـاوەن لێبـوردوویی و بەخششت بوون.

**بخـشش کـردن:** بـەخـشینەوە؛ بـەخـشانەوە؛ بـەخشـشتکـردن؛ شـت بـە دیتـران بەخشین.

**بخـشنامه** / baxšnāme، ـها/: *اسم.* بـەخـشنامە؛ نامـەیـەک کـە لـە لایـەن بـالاترین پلـەی دامـەزراوەیـەکـی ئیداریـەوە بـۆ ڕێنـوێنی و ئاگادارکردنـەوەی تـەواو یـان بـەشـێک لـە دامەزراوان دەنێردرێت.

**بخشندگی** / baxšandegî، ـها/: *اسم.* دلاوایـی؛ بـەخـشێنەری؛ دەهنـدەیـی؛ بـار و دۆخ یـان چۆنیەتی دلاوا بوون.

**بخـشنده** / baxšande، ـگان/: *صفت.* دەهنـدە؛ دەهـەنـدە؛ دلاوا؛ بـەخـشەنـە؛ بـەخـشندە؛ دەسـڤاز؛ شـیەچـگ؛ دەسـەنـەدار؛ دایـنـدە؛ وسـاخ؛ توانـا و خووگرتـوو بـە بـەخـشین ‹خداونـد بخـشندەی مهربـان: خـودای دەهنـدەی دلۆڤان›.

**بخـشودگی** / baxšûdegî، ـهـا/: *اسـم.* ١. بـەخـشراوی؛ ئـازاد بـوون لـە سـزا و تـاوان ‹بخشودگی زندانیان سیاسـی: بـەخشراوی بـەندیـە سیاسیەکان› ٢. بـەخـشانە؛ بـەخـشینە؛ ئـەوەی کـە بـۆ بـەخـشین دەبـێ ‹بخشودگی مالیـاتی: بەخشانەی پیتاکی›.

**بخـشودن** / baxšûdan/: *مـصدر. متعـدی.* //**بخشودی:** بەخشیت؛ **مـیبخـشایی:** دەبـەخـشی؛ **بـبخش:** ببـەخـشە// بـەخـشین؛ بـووردن؛ لێبـووردن؛ لێبـوورین؛ عـافوکردن؛ بـەخـشەی؛ بـەخـشای؛ چنـەویـەردەی؛ لـە گونـاهی کـەسـێک خـۆش بـوون و تۆڵـەی لـێ نـەسـتاندنەوە: **بخـشاییدن.** هـەروەهـا: **بخشودنی**

■ صـفت فـاعلی: **بخـشاینده** (بـەخـشێنەر)/ صـفت مفعـولی: **بخـشوده** (بـەخـشێنراو)/ مـصدر منفی: **نَبخشودن** (نەبەخشین)

**بخشی** / baxšî/ ☜ **مَقسوم**

**بخشیاب** / baxšyāb/ ☜ **مَقسومعَلَیه**

**بخشیدن** / baxšîdan/: *مصدر. متعدی.* //**بخشیدی:** بەخشیت؛ **میبخشی:** دەبەخشی؛ **ببخش:** ببەخشە// بـەخـشین؛ بـەخـشەی: ١. بـەخـشینەوە؛ تەخشانکردن؛ بە خۆڕایی شتێ دان بە کەسێک ‹بخشیدن به مستمندان: بـەخـشین بـە هـەژاران› ٢. خۆشـبوون؛ بـواردن؛ عـافوکردن؛ لێبـوردن؛ بەخشان؛ بگردن ‹بخشیدن محکومان: بـەخـشینـی تاوانباران›.

■ صـفت فـاعلی: **بخـشنده** (بـەخـشەر)/ صـفت مفعـولی: **بخـشیده** (بـەخـشراو)/ مـصدر منفـی: **نَبخشیدن** (نەبەخشین)

**بخـصوص**¹ / bexusûs, bexosûs/: [فارسـی/ عربی] *صفت.* ئـەوتـۆ؛ تایبـەتی؛ تایبـەت؛ تـەیبـە ‹آدم بخـصوصی اسـت؛ حـرف بخـصوصی نـزد: کەسێکی تایبەتـە؛ وتەیەکی نەوتوی نەوت›.

**بخـصوص**²: *قیـد.* بـەتایبـەت؛ نـەخـوازا؛ نەخوازەلا؛ نـەوازا ‹بخصوص در اینجا کـە حق بـا او بود: بەتایبەت لێرەدا حەق بە ئەو بوو›.

**بخل** / boxl/: [عربی] ☜ **بخیلی**

**بخـو** / boxow, boxo:/، ـهـا/: [ترکـی]*اسم.* پاوەن؛ پاوانە؛ پێبەند؛ بازنـەیـەک کـە بـە پێـی چوارپێیانەوە دەبەستن تا نەجوولن.

**بخـوبر** / boxowbor, boxo:-/، ـهـا/: [ترکـی/ فارسـی] *صـفت.* [کنـایی] سـەربزێـو؛ بـزۆز؛ سـەربـزۆک؛ سـەرکـەش؛ سـەرکێش؛ لاسـار؛ خۆڕا؛ گوێنەدەر؛ مەرەخەس؛ بێگوێ.

**بخوبریده** / boxowborîde, boxo:-/، ـها/: [ترکی/ فارسـی] *صفت.* بێگـوێ؛ سـەربزێـو؛ سـەرکـەش؛

مەرەخەس؛ گوێنەدەر.

**بخوبی** / bexûbî/: *قید.* بەباشی؛ بەچاکی؛ بەخاسی؛ چاک؛ باش: ۱. شیاو؛ جوان؛ چۆنیەتی و بارودۆخێکی باش ‹عروسی بخوبی برگزار شد: زەماوەندەکە باش بەڕێوە چوو› ۲. بە تەواوی؛ خاس ‹او بخوبی می‌دانست من پول ندارم: ئەو باش دەیزانی کە من پارەم نیە›.

**بخور** / boxor/: *صفت.[گفتاری]* بخۆر؛ بخوەر؛ خۆرا؛ هەماوەر: ۱. ئەخۆم؛ بوەرمێ؛ پڕحەز و ئیشتیا ۲. خاوەن توانست و ویست بە خواردنی شتێ ‹اگر پلوخورشت باشد، بخورش هستم: ئەگەر پلاوخۆرشت هەبێ، بخۆرین›.

**بخور** / buxûr, boxûr/: [عربی]*اسم.* بخوور؛ بغورد؛ بوخورد؛ سووتەمەنی بۆنخۆش: ۱. هەرکام لەو سووتەمەنیانە کە بۆنخۆشکەرەوەن ۲. دەرمانێک کە هەتوانێ کە نەخۆش وەبەر هەڵمەکەی دەدەن.

▣ **بخورِ مریم** ☜ **نگونسار**[1]

**بخورـ بخور** / boxorboxor/: *اسم.[گفتاری]* ئاخۆران- باخۆران؛ خواردنی لە ڕادە بەدەر و (زۆرتر) بە کۆمەڵ.

**بخور و بخواب**[1] / boxor-o-bexāb، ـها/: *اسم.[گفتاری]* تەمبەڵی؛ تەوەزەلی؛ خواردن و خەفتن ‹پسرجان وقت کار است نه بخور و بخواب: کوڕی خۆم وەختی کارە نەوەک تەمبەلی›.

**بخور و بخواب**[2]: *صفت.[گفتاری]* خۆری و تۆری؛ تەمبەڵ و تەوەزەل؛ قنگران؛ قنبەتاڵ ‹هر چه آدم بخور و بخواب بود دورش را گرفته بودند: هەرچی خوری و توری بوو دەوریان دابوو›.

**بخور و نمیر** / boxor-o-namîr/: *صفت.* نەقڕ نەپڕ؛ نەمر و نەژی؛ بژی و مەمر؛ مەمرەمەژی؛ بخۆ و مەمرە؛ نەوەر و نەمەر؛ مەرگ‌ومەژی؛ دەست و دەڤ؛ دەست لەدەڤ؛ کولەمەرگ؛ کەمترین ئەندازەی پێویست بۆ گوزەرانی ژیان ‹غذای بخور و نمیر: خواردنی نەمر و نەژی›.

**بخیل** / baxîl، ـها/: [عربی] *صفت.* ۱. ڕژد؛ چاونەزێر؛ چکووس؛ چرووک ۲. چنۆک؛ چاونەزێر؛ چاونەباز؛ حەسوود؛ ئیرەییبەر؛ گاڤبەر ۳. بەرچاوتەنگ؛ چاوچنۆک؛ چەڵماس.

**بخیلی** / baxîlî/: [عربی]*اسم.* چەڵماسی: ۱. ڕژدی؛ دەس‌قووچاوی؛ چرووکی؛ چکووسی؛ وشکەهەوەڕی ۲. ئێرەیی؛ چاونەباری؛ چنۆکی؛ چاونەزێری؛ گاڤبەری ۳. بەرچاوتەنگی؛ چاوچنۆکی؛ وەرەچەم تەنگی.

**بخیه** / bax(i)ye، ـها/: *اسم.* کۆک؛ باخیە؛ کێلەک؛ تەقەڵ؛ تەقەل؛ نوێرد؛ تیک؛ تەقەلە؛ قەیدەک؛ قولپک؛ جۆرێ دروومان کە بەنەکەی تێدا خاڵ و خێڵ دیارە.

▣ **بخیه به آبدوغ زدن:** *[مجازی]* ئاو بێژان؛ ئاوکوتان؛ ئاو لە ئاوان کوتان؛ ئاو خەست کردنەوە؛ ئاو هەسەوکردن؛ کاری گۆترەکردن.

**بخیه زدن/کردن:** تەقەڵ لێدان/ دان.

**بد**[1] / bad، ـها؛ ـان/: *اسم.* نەباش؛ خراپ؛ خراو؛ خەرا؛ خەراب؛ خەراو؛ گەندە؛ گەنە؛ گەن؛ بەد؛ بەی؛ بەو؛ ڕەش؛ سیا؛ گەس؛ کەس یان شتی ناخۆش یان نالەبار.

▣ **بد آمدن از کسی/ چیزی:** قین هەبوون لە کەسێ/ شتێک؛ ڕق لە کەسێ/ شتێک بوون؛ بێزاری و ناخۆشی لە بەرانبەر کەسێ یان شتێکەوە ‹او خیلی از بادنجان بدش می‌آید: زۆر قینبەتی لە باینجان›.

**بد آوردن:** نوشوست هێنان؛ نکوولی

هێنان؛ زیان کردن لە ژیاندا؛ لێ قەومان؛ لێ قەومیان؛ لێ قەومین؛ بارکەوتن؛ بارکەفتن. هەروەها: **بد دیدن**

**بد به دل راه ندادن** ☜ به دل بد نیاوردن، **دل**

**بد کردن**: خراپەکردن؛ کاری نابەجێ کردن؛ کاری نالەبارکردن؛ خراوی کردن.

**بد کسی را خواستن/ نخواستن**: *[گفتاری]* خراپەی کەسێک ویستن/ نەویستن.

**بد گفتن**: خراو وتن؛ خاس نەوتن؛ قسەی ناخۆش، ناشیرین یان نارەوا وتن.

**بد** [۲]: *صفت.* ۱. ناخۆش؛ بەد؛ بەو؛ نەگەویس؛ گەس؛ گەست؛ ناوەش ‹روز بدی بود: ڕۆژێکی ناخۆش بوو› ۲. نابار؛ خراپ؛ خراو؛ نارەوا؛ ناشایست.

**بد** [۳]: *قید.* خراپ؛ خراو؛ بەخراپی؛ بەناخۆشی ‹خیلی بد کار می‌کند: زۆر خراب کاردەکا›.

**بد ـ** [۴]: *پیشواژە.* بەد- ؛ بەو- ؛ بەی- ؛ گەن- ؛ خراپ- ؛ پیس- ؛ گەس- ؛ بەور- ؛ - ڕەش؛ ڕەش- ؛ سیا- ؛ -سیا؛ -پیس؛ ناخۆش و ناحەز؛ خاوەن چۆنیەتییێکی ناخۆش و نەویستی ‹بدقیافە؛ بدچشم: بەدتەسک؛ چاوپیس›.

**بدآموز** / badāmûz، ـها/: *اسم.* گەستار؛ گەستاوەر؛ بەدئامۆژ؛ توانا لە فێرکردنی خراپە.

**بدآموزی** / badāmûzî، ـها/: *اسم.* گەستاری؛ بەدئامۆژی؛ کار یان ڕەوتی خراپە فێرکردن.

**بداختر** / badaxtar/: *صفت. [ادبی]* چارەڕەش؛ ڕۆژڕەش؛ بەدشانس؛ بەدبەخت؛ گناتەدێر؛ کلۆڵ؛ سیاچارە؛ سیابەخت.

**بداخلاق** / badaxlāq/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بەدخۆ؛ ناکەس؛ بەدئەخلاق؛ نانەجیب؛ ناکەس بەچە؛ نەتوو؛ ئەخم‌تیەل؛ لەلبایە: ۱. بە ڕێ و ڕەوشتی هەڵنەسەنگاو؛ ئاکارخراپ؛ بەدخوو ‹زنش خیلی بداخلاق بود: ژنەکەی زۆر بەدخو بوو› ۲. خاوەن خوو و ڕەوشتی ناپەسەند لە کۆمەڵگادا ‹با این آدمهای فاسد و بداخلاق نشست و برخاست مکن: لەگەڵ ئەم گەندەڵ و ناکەسانە هەڵس‌وکەوت مەکە›.

**بداخلاقی** / badaxlāqî، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* بەدخۆیی؛ بەوخۆیی؛ بێ‌فەڕێ.

**بداخم** / bad'axm/: *صفت.* ئێسکقورس؛ خوێنتاڵ؛ ڕەزاگران؛ کرێت؛ دڵهشک؛ ڕووگرژ؛ مۆڕ (بۆ نێر)؛ مۆڕە (بۆ مێ)؛ مڕ و مۆچ؛ ناوچاوتاڵ؛ ڕووتاڵ.

**بداصل** / bad'asl/: [فارسی/ عربی] *صفت.* نارەسەن؛ بەدرەسەن؛ بن‌میتانە؛ بۆرە؛ ڕەمەکی و سەرنەناس.

**بداغ** / bodāq، ـها/: [ترکی] *اسم.* نەویران؛ گوڵەدووگ؛ گوڵەدووگە؛ گوڵەدووف؛ دارچکێکی چەن ساڵەیە لە تیرەی گەنەدار بە گوڵی درشت و جوانەوە.

**بداغر** / bad'oqor/: [فارسی/ ترکی] *صفت.* *[گفتاری]* قۆشمە؛ بەدفەڕ.

**بدان** [۱] / bedān، ـان/: *صفت. [ادبی]* بە ئەو؛ بەو؛ بە وی؛ پا ‹بدان گونە: بەو جۆرە›.

**بدان** [۲]: *ضمیر. [قدیمی]* بەو؛ بە ئەو؛ بەوەو؛ بەوکەسە؛ پادی (بۆ نێر)؛ پادێ (بۆ مێ) ‹با کە گفتی؟ بدان: بە کێت گوت؟ بەو›.

**بداندیش** / badandîš، ـها؛ ـان/: *اسم. [ادبی]* گومان‌ڕەش؛ بیرخراو؛ بیرچەپەڵ؛ بێ‌فەڕ و دڵ‌پیس؛ کەسێ کە لە دژی کەسانی‌تر بیر دەکاتەوە و پیلان دەڕێژێت.

**بداهت** / badāhat, bedāhat/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* ئاشکرایی؛ ڕاشکاوی؛ خویایی؛ ئاشکرا بوون.

**بدایت** / bedāyat, badāyat/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* سەرەتا؛ هەوەڵ؛ دەسپێک ‹در بدایت امر اطلاع درستی نداشتم: لە سەرەتاوە باش

نەمدەزانی›.

**بدایع** / badāye'/: [عربی] جمعِ ☜ **بَدیع**

**بــدباطن** / badbāten/: [فارســی/ عربــی] *صـفت.* دڵڕەش؛ دڵـپیس؛ بـەدڕا؛ بـەددڵ؛ خـاوەن بـیر و بۆچوونگـەلی گـەن لـەبـارەی دیتراونـەوە ‹نبایـد فریـب ایـن مـرد خـوش‌ظـاهر و بـدباطن را می‌خوردی: نەمەشیا فریـوی ئـەم پیـاوە بـە ڕواڵـەت خوەش و دڵڕەشەت بخواردایە›.

**بــدبخت** / badbaxt، ـهـا/: *صـفت.* کـڵۆڵ؛ کرۆڵ؛ بەوبەخـت؛ بـەدبـەخـت؛ قـەرەبـەخـت؛ چـارەڕەش؛ بـەرگـەشـتە؛ دامـاو؛ دامـاگ؛ دێـز؛ کتـــۆر؛ ڕۆژڕەش؛ قـــەشـــقە؛ بۆنـــەهـــاتوو؛ بۆنـــەهاتـــگ؛ بێوڵـــەت؛ بارکـــەوتـــوو؛ هەرگبەسەر؛ هەڕیوەسەر؛ نامەی.

**بدبختانــه** / badbaxtāne/: *قیـد.* بــە داخـــەوە؛ مخـابن ‹بدبختانـه نمـی‌تـوانم بیـایم: بـە داخـەوە ناتوانم بێم›.

**بــدبختی** / badbaxtî، ـها/: *اسم.* بـەدبـەخـتی؛ کولۆڵـی؛ کامبـاخی؛ بـەرگـەشـتی؛ نـەهـاتی؛ سیاچارەیـی؛ ڕۆژڕەشـی؛ کرۆڵـی؛ کوڕۆڵـی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی بـەدبـەخـت بـوون ‹بـدبختی و خوشـبختی هـر کـس دسـت خـودش اسـت: هـات و نەهاتـی هـەرکـەسـێک بـە دەسـتی خۆیـەتی› ٢. نـاراو؛ مـورووز؛ نـەگبـەتی؛ ڕووداوی ناگـەوار و نالـەبـار ‹زن گـرفتن او بـدبختی بزرگـی بـود: ژن خواستنی بەدبەختیەکی گەورە بوو›.

**بدبده** / badbade/ ☜ **بِلدِرچین**

**بــــدبو** / badbû/: *صــفت.* بۆگـــەن؛ ســـێفتۆ؛ سفتۆ؛ گـەنـار؛ حـەف؛ حـەفـار؛ خمـڵ؛ بـوەن؛ بۆن ناخۆش؛ بۆن‌پیس.

**بــدبوم** / badbûm/:/*اسم.* ئـاودر؛ ئاودرگـــە؛ دڕناڵ؛ کـەنـداڵ؛ نـەواڵ؛ نـواڵ؛ گۆڕاییێـک کـە بە هۆی ئـاوی بـە گـوڕەوە کـەنـد و کـەنداڵـی تێکەوتووە.

**بــدبیار** / badbiyār، ـها/: *صفت.* کـڵۆڵ؛ کـرۆڵ؛ بـەوشـانس؛ بـەدسـەکـوت؛ نامـەد؛ تووشـیاری نەهاتی و نهامەتی ‹مـرد بـدبیاری اسـت، هـر وقـت مـی‌رود مـسافرت، دزد خانـەاش را مـی‌زنـد: پیـاوێکی کـڵۆلە، هــەرکاتێــک دەچێتــە ســەفــەرەوە دز ماڵەکەی دەبڕێ›.

**بــدبیاری** / badbiyārî، ـهـا/: *اسـم.* کـڵۆڵی؛ کرۆڵـــی؛ کوڕۆڵـــی؛ نامـــەدی؛ نوشوســـی؛ نوشوســـتی؛ نهامـــەتی؛ بـــەو بـــەخـــتی؛ بارکەفتوویی؛ نەهاتەی؛ نەهاتی.

▣ **بـدبیاری آوردن**: تووشـی نـەهـاتی بـوون؛ لێ‌قەومان؛ لێ‌قەونیان؛ بەخت‌کەوتن.

**بــدبین** / badbîn، ـها؛ ـان/: *صفت.* ڕەش‌بـین؛ چاوتاریک؛ بـەدبـین؛ خـاوەن ئـۆگرەتی و وازی ڕەش‌بـــــینی؛ خـــــاوەن لێکدانـــــەوە و هـەڵـسەنگانـدنی خـراپ و داوەری چـەوت بەرانبـەر بـە کـەسانی‌تـر، یـان دیـاردەگـەل و ڕووداوگـەل ‹آدم بـدبین خیـال مـی‌کنـد هـوا بـرای ایـن ابـری شـده اسـت کـه او نتوانـد رختهـایش را خشک کنـد: مـرۆی ڕەش‌بـین وادەزانـێ هـەوا بۆیـە بـووەتـە هـەور کـە نـەهێـڵێ جلـەکـانی هـەڵـخا و وشکی‌کاتەوە›. هـەروەهـا: **بـدبین بـودن؛ بـدبین شدن؛ بدبین کردن**

**بــدبینی** / badbînî، ـهــا/: *اســم.* ڕەش‌بـینی؛ چاوتـاریکی؛ لێکدانـەوە و داوەری نـەیارانـە، لـە بـــارەی دیترانـــەوە یـــان دیـــاردەگـــەل و ڕووداوانەوە.

**بــدپیلگی** / badpîlegî، ـهـا/: *اسم.* لاسـاری؛ ورکـــنی؛ ســـەرکێـــشی؛ چـــەقـــاوەســـوویی؛ چەقەسرۆیی؛ چـەتـوونی؛ تووترکـەسـەری ‹تـو بـا ایـن کینـەتـوزی و بـدپیلگی خـودت را خـراب مــی‌کنــی: تــۆ بــەم ڕک و ورکنیــەت خــۆت ئەدۆڕێنی›.

**بدپیلــه** / badpîle/: *صـفت.* [گفتـاری] لاسـار؛ ورکن؛ چەقاوەسوو؛ چـەقـەسرۆ؛ سـەرکێش؛ چەتوون؛ تووترکەسەر؛ ناکولۆکار.

**بــــدترکیب** / badtarkîb/: [فارسـی/ عربـی] صفت. دزێـو؛ نابـار؛ دشـت؛ نـەچـێ؛ نـاجۆر؛ بـێقـولخ؛ کرێـت؛ بـەدتـەشـک؛ ناحـەز؛ ناشیرین؛ ناشرین.

**بــدجنس** / badcens/: [فارسـی/ عربـی] صفت. بەدفەڕ؛ ناجسن؛ بەوجنس؛ خاوەن بیر و هـزری خراپ.

**بدجنسی** / badcensî، ـها/: [فارسی/ عربـی] /اسم. ناجسنی؛ بـەوجـنسی؛ بـەدفـەڕی: ١. کـار یـان ڕەوتی بـەدفـەڕی ‹بدجنسی برایش عـادت شـده بـود: بەدفەڕی ببـووە خوویـەک بـۆی› ٢. کـردەوەیـەک بـۆ ئـازاردانی کـەسـێ‌تـر، بێئەوەی قازانجێکی بۆ خۆی هەبێ.

**بــدحال** / badhāl/: [فارسـی/ عربـی] صـفت. حاڵ خراپ؛ حاڵشڕ؛ پەک‌کەوتـوو؛ کـەنـەفت؛ کەلەلا؛ ناحاڵ؛ ناخۆش.

**بــدحالی** / badhāli/: [فارسـی/ عربـی] /اسم. ناکۆکی؛ بێ‌کەیفی؛ بەدحالی.

**بدحــــساب** / badhesāb/: [فارسـی/ عربـی] صفت. قـەرزکـوێر؛ قـەرزکـوژ؛ سـەرچـەوت؛ کـەچ‌حـەسـاو؛ حیساب‌ناڕاسـت ‹بهتر است با آدمهـای بدحساب معامله نکنـی، چون هـم پولـت را می‌خورند و هم دچار دردسرت مـی‌کنند: چـاکتر وایـە لەگەڵ مرۆی قەرزکوێردا مامـەڵـە نـەکـەی، لـەبـەر ئـەوە هـەم پـارەکـەت دەخـۆن، هـەم تووشـی چەرمەسەریشت دەکەن›.

**بدحـسابی** / badhesābî، ـها/: [فارسی/ عربـی] /اسم. سـەرچـەوتی؛ قـەرزکـوێری؛ قـەرزکـوژی؛ کـەچ‌حـەسـاوی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی نـەدانـەوەی قـەرزی خـەڵـک لـە سـەر وادەی خۆیدا.

**بدخشی** / badaxšî، ـها؛ ـان/: صفت. بـەدەخـشی؛ سەبارەت بـە پارێزگـای بـەدەخـشان لـە وڵاتی ئەفغانیستان.

**بدخو** / badxû، ـیان/: صفت. [ادبی] تـرش‌وتـاڵ؛ ناوچاوگرژ؛ ناوچاو دێز؛ بەدخۆ؛ نەگونجاو.

**بــدخواب** / badxāb/: صـفت. خـەوشـێواو؛ خەوزڕاو؛ خەو لـێ شـێواو؛ بـە خـەوی لێکبـڕاو و ناسەرەوەخت.

**بدخواه** / badxāh، ـان/: صفت. بەوخواز؛ بـەدواز؛ خراپەویست؛ دژ؛ خوازیـاری خراپـەی خـەڵـکی ‹عزیزم، پدر که بدخواه پسرش نمی‌شود: گیانـە، بـاوک بەوخوازی کوڕی نابێ›.

**بـدخواهی** / badxāhî، ـها/: /اسم. بـەوخـوازی؛ بـەدوازی؛ خراپـەویستی؛ بـە ئـارەزووی خراپـە بـوون بـۆ خـەڵـک: ١. دۆخ یـان چۆنیـەتی بەوخواز بوون ٢. کار یـان ئاکارێـک بـۆ تـووش کـردنی کـەسـان ‹او قـصد بـدخواهی نداشت: ئـەو نیازی بەوخوازی نەبوو›.

**بــدخوراک** / badxorāk/: صـفت. دژخـۆر؛ دژخــــۆراک؛ دژلــــەوەڕ؛ دوودڵ لــــە خـواردەمـەنیدا؛ خـاوەن خـۆ یـان هـۆگرەتی نائاسـایی سـەبـارەت بـە خـواردن (وەک نەخواردنی زۆرێک لە چێشتگەل): **بدغذا**

**بـــدخیم** / badxîm/: صـفت. [پزشـکی] بێدەرمـان؛ بـێچـارەسـەر؛ بـەکاردانـەوەیێکـی خراپ و زیانبـارەوە ‹بیماری بدخیم: نـەخۆشـینی بێ‌چارەسەر›.

**بـــددل** / bad.del/: صـفت. ١. بـەودڵ؛ دڵ‌پـیس؛ بیرخـراپ ٢. دڵ‌گـران؛ دڵ‌ڕەنجـاو؛ دڵ‌شـکاو؛ دڵـمەن؛ دڵـمەنـد؛ دڵ‌ئێـشاو ‹از حرفهـای مـن کمـی بددل شـد: لـە قسەکـانی مـن نـەختێـک دڵ‌گـران بـوو› ٣. کـەمدڵ؛ بـە بـێ‌تاقـەت و خـۆڕاگری لـە ئاسـتی دیـتنی شـتانێکی پـیس و ناخۆشـەوە. هـەروەهـا: **بددلی**

**بـــددماغ** / bad.damāq/: [فارسـی/ عربـی] صـفت. لـووت‌بـەرز؛ بـەدەمـار؛ دەمـاراوی؛ گـەوەزە؛ لـەخۆبـایی؛ خـۆ پـەسێن؛ خـۆ بـە زل‌زان.

**بــددوا / bad.davā/:** [فارسـی/ عربـی] *صفت.* دەوابێز؛ بەودەوا؛ دەوانەخۆر؛ سەخت گیر لە دەوا خواردنـدا (وەک ئـەوەی نـەیخوا یـان بـەزۆر بکەوێتە قەرەیدا).

**بــددهن / bad.dahan/:** *صفت.* دەم‌پیس؛ جنێوفرۆش؛ جوێن‌فرۆش؛ دوژێن‌فرۆش؛ دژمێن‌دەر؛ دەم‌چەپەڵ؛ زمان‌پیس؛ دەڤ‌پیس؛ زمان‌شڕ؛ دەڤ‌چێر؛ دەڤ‌گەنی؛ سخێف‌بێژ؛ زمان‌ڕەش؛ کەچ‌کەلام؛ دژمان‌دەر؛ ناڤدایەک؛ تایبەتمەندی کەسێک کە قسەی ناشیرینی بە زاردا دێ.

**بــددهنی / bad.dahanî،** ـها/: *اسم.* جنێوفرۆشی؛ جوێن‌فرۆشی؛ دەم چەپەڵی؛ زمان پیسی؛ زمان‌شڕی؛ کار یان ڕەوتی وتنی قسەی ناشیرین، جوێناوی و پیس.

**بــدذات / badzāt/:** [فارسـی/ عربـی] *صفت.* بەدهیم؛ ناجسن؛ بەوجنس؛ بەودڵ؛ بە بیر و کرداری خراپە. هەروەها: **بدذاتی**

**بــدر / badr/:** [عربـی]/*اسم.* مانگی چاردە؛ مانگی‌پڕ؛ هلاب؛ هەیڤاپڕ؛ چواردە شەوە؛ حاڵەتی مانگ کاتێک نیوەی ڕۆشنی ڕوو بە زەویە و وەک جەغزێکی تەواو دیارە.

**بــدراه / badrāh/:** *صفت.* لاڕێ؛ بەدڕا؛ ڕێ‌چەوت؛ خوێڕی؛ وێڵەکی؛ خاوەن ئاکاری ناشایست و دژ بە ئەخلاق.

▣ **بدراه شدن:** خوێڕی بوون؛ هەڵە بوون؛ لە ڕێ دەرچوون؛ خراو بوون؛ لاڕێ بوون.
هەروەها: **بدراه کردن**

**بدرستی / bedorostî/:** *قید.* بەچاکی؛ بە دروستی؛ ڕێک ‹پولها را بدرستی میان بچەها تقسیم کرد: پارەکانی بە چاکی لە نێوان منداڵەکاندا دابەش کرد›.

**بــدرفتار / badraftār/:** *صفت.* بەدئاکار؛ بەدکردار؛ قیچمەز؛ بەدڕەفتار؛ بەدخوو؛ لاسار.

**بدرفتاری / badraftārî،** ـها/: *اسم.* بەدئاکاری؛ بەدکرداری؛ قیچمەزی؛ بەدڕەفتاری؛ بەدخوویی؛ لاساری.

**بدرقــه / badraqe/:** [معـرب از فارسـی]/*اسم.* ۱. ڕوانە؛ کار یان ڕەوتی ڕوانەکردن؛ ڕەوانە کردن؛ بەدرەقە؛ میوان بەڕێ‌کردن؛ بەڕێ کردنی کەسێ کە دەڕوا، بە نیشانەی میهرەبانی و ئەدەب ‹مهمانها را تا سر کوچه بدرقه کردم: میوانەکانم تا سەر کۆڵانەکە ڕوانە کرد› ۲. کار یان ڕەوتی بردن؛ گواستنەوەی بەندی؛ بەڕێ‌کردن ‹من صدها زندانی را بدرقه کردەام: سەدان بەندیم بەڕێ کردووە› ۳. ئاستەڕی بەرگی کتێب لە ناوەوە.

**بــدرکاب / badrekāb/:** [فارسـی/ عربـی] *صفت.* بەدڕەفت؛ بەوڕەفت؛ لاجڵەو؛ ڕەپ؛ ڕەق؛ سرک؛ بە دۆخ یان چۆنیەتیەکی ناخۆش لە سواریدا ‹اسب خیلی بدرکاب بود: ئەسپەکە گەلێک بەدڕەفت بوو›.

**بــدرگ / badrag/:** *صفت.* ۱. *[پزشکی]* بێ‌ڕەگ؛ خاوەن ڕەگی نادیار یان باریک کە دەرزی وەشاندنی دژوار بێ ۲. *[مجازی]* تووترکەسەر؛ سەربزێو؛ یاخی ‹با آدم بدرگ و ناتو نمی‌شود کنار آمد: لەگەڵ مرۆی سەربزێو و لاساردا ناکرێ پێک بێت›.

**بــدرنگ / badrang/:** *صفت.* قرتۆنی؛ ناحەز؛ ناشیرین؛ بەوڕەنگ؛ نەچێ؛ کرێت؛ دزێو.

**بــدرود / bedrûrd/:** *دعا.* مالاوا؛ خواحافیز؛ وەش ئاما؛ وەخێرچی؛ خاترێوە؛ وشەیەکە لە کاتی لێک‌جیابوونەوەدا دەیڵێن ‹بدرود ای روزهای خوش جوانی!: مالاوا ئەی ڕۆژانی خۆشی لاوەتی!›.

▣ **بــدرود زنـدگی گفـتن:** *[ادبـی]* کۆچی یەکجاری‌کردن؛ مالاوایی‌کردن لە ژیان؛ مردن؛ نەمان.

**بــدرود گفتن:** مالاوایی‌کردن؛ وەش ئامای

واتەی.

**بــدره** / badre. ـهـا/: *اسـم. [قـدیمی]* کیسـک؛ هەنبانە؛ هەمانە؛ کیسەی دراو.

**بدسـابقه** / badsābeqe. ـهـا/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت.* شـوێنچـەپـەڵ؛ شـوێنپـیس؛ بـەدنـاو؛ دانـستەی ئـەو کـەسـەی کـە ڕابردوویـەکـی باشـی نـەبـێ و کـردەوەی نـاڕەوای زۆر بـێ ‹بعـضی از ایـن شـریکهایت آدمهـای بدسـابقه‌ای هـستند: بـڕێ لـەم هاوبـەشـانەت مرۆڤـەلێکـی شوێنچەپەڵن›.

**بدسـت** / bedast/: *اسـم. [ادبـی]* بـست؛ بنگـووس؛ بـس؛ ویـەسـە؛ یـەسـە؛ یـەکـەی پێوانـەی کـۆن، لـەم سـەری قـامکی گـەورەوە هەتا ئەو سەری قامکە چکۆلە بە ئاوەڵایی.

**بدسرشـت** / badserešt. ـهـا/: *صـفت. [ادبـی]* بەدفەڕ؛ بەدخوو؛ بێمەک.

**بدسگال** / badsegāl/: *صفت. [ادبی]* خانەگومـان؛ خانگمان؛ بیرخراپ؛ دڵپیس؛ دڵچەپەڵ.

**بدسلیقگی** / badsalîqegî. ـهـا/: [فارسـی/ عربـی] *اسم.* بەدسەلیقەیی؛ گەنەخڕی.

**بدسـلیقه** / badsalîqe/: [فارسـی/ عربـی] *اسـم.* بەوسەلیقە؛ بەدسەلیقە؛ گەنپەسەن؛ گەنـەخـڕ؛ بێتوانایی ناسین و هـەڵـبژاردنی شـتی بـاش و لەبار.

**بدسـیما** / badsîmā/: *صـفت.* بـەدتـەشـک؛ بەدماژی؛ ناشیرین؛ ماژەگەن؛ کرێت.

**بدشـــانس** / badšāns/: [فارسـی] *صـفت.* بەدشانس؛ بێبەخت؛ خایەن؛ غایەن.

**بـدعت** / bed'at/: [عربـی] *اسـم.* کـار یـان ڕەوتی داتاشـین؛ نـوژن؛ لـە خـووە دەرهێنـان؛ داهێنانی نـەریت یـان ئـایینێکی نـوێ کـە دژ بە ڕست و لە لای خەڵکەوە دزێو بێ.

◘ **بـدعت‌گذاشـتن:** (تـازە) داهێنـان؛ شـێوە و ڕەوشتی تـازە دانـان ‹ایـن روش دونرخـی کـردن را دولـت سـابق بـدعت گذاشـت: ئـەم شـێوەی دوونرخی‌کردنەوە دەوڵەتی پێشوو دایهێنا›.

**بـدعنق** / bad'onoq/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت. [گفتـاری]* ئاڵـۆز؛ ناسـاز؛ نـەسـاز؛ نـەسـازای تـووشوتـووڕە ‹امـروز از اول صـبح همـین طـور بدعنق بود: ئەمڕۆ هەر لە بەیانیەوە ئاڵوز بوو›.

**بدغـــذا** / badqazā/: [فارسـی/ عربـی] ☜ **بدخوراک**

**بدقــدم** / badqadam/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت.* پـێڕەش؛ پاسـیاو؛ پاپـەڕخـراو؛ شـووم؛ پـێ و قەدەم شـووم؛ سـەرەوەرە؛ سـەرەخـۆر؛ پاوشـک ‹حـالا کـه آقـا مـرده، لابـد همـه مـی‌گوینـد عـروس بدقـدم بـود: ئێـستا کـە ئاغـە مـردووە، بـێشـک خەڵک دەڵێن بووک پێڕەش بووە›.

**بــدقلب** / badqalb/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت.* دڵپـیس؛ دڵڕەش؛ بـەدڕا؛ بـەددڵ؛ بیرخـراپ؛ بـە ویـست و هزرێکـی خـراو لـە ئاسـتی کەسانیترەوە.

**بــدقلق** / badqeleq/: [فارسـی/ ترکـی] *صـفت. [گفتـاری]* نـەگونجـاو: ١. دەمـەدەمـی؛ بـەدڕەوشـت؛ بـەدخـۆ؛ بـەدمحـانج ٢. ناسـاز؛ نـەسـاز ‹شـاگردمان خیلـی بـدقلق اسـت: شاگردەکەمان زۆر ناسازە›.

**بــدقلقی** / badqeleqî. ـهـا/: [فارسـی/ ترکـی] *اسـم. [گفتـاری]* ١. لاسـاری؛ نـەگونجـاوی ٢. سـەرەڕۆیـی؛ سـەربزێـوی ‹کـارگرش بـدقلقی مـی‌کـرد، بیـرونش کـرد: کاریگـەرەکـەی سـەربزێـوی دەکرد، دەری کرد›.

**بــدقواره** / badqavāre/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت. [گفتـاری]* بـەدنـژم: ١. نارێـک؛ بەدقەوارە؛ بەودوخت؛ بەوبار؛ بـەئـەندازەگـەلی نـارێژە ‹زمـین بـدقواره: زەوی نارێـک› ٢. بـە بیچمـی نـاخۆش؛ بـەوتـەشـک؛ بـەدتـەشـک؛ تسولگ.

**بـدکار** / badkār. ـهـا؛ ـان/: *صـفت.* خراوکـار؛ خراپکار؛ بەدکـار؛ ئاکـار ناپـەسـەنـد؛ گـاریس؛

گەنەکار؛ ناخار؛ بەڕێ و ڕەوشتی چەوت کە بەتایبەت دەبێتە هۆی ئازار یا زیانی دیتران.

**بدکارگی** / badkāregî/: *اسم.* بەدئاکاری؛ بەدکاریەتی؛ خراپەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەد ئاکار بوون.

**بدکاره** / badkāre، ـها/: *صفت.* خراوکارە؛ خراپە؛ بەد ئاکار؛ گەنەکارە؛ خاوەن پێشینەی خراپ و ناشایست.

**بدکاری** / badkārî/: *اسم.* خەراوی؛ خراپی؛ بەدفەڕی؛ بەدکاری؛ خراپەکاری؛ کار یان ڕەوتی کاری نالەبارکردن.

**بدگل** / badgel/: *صفت. [گفتاری]* گۆشتاڵ؛ خوێنتاڵ؛ شەنی؛ ئێسک‌گران؛ ناشیرین؛ نەجوان؛ بەدتەشک؛ درێو؛ ناحەز؛ گەست؛ نەچێ: بەرانبەر: **خوشگل**

**بدگمان** / badgomān/: *صفت.* بەدگومان؛ گومان‌ڕەش؛ بیرخراو؛ خەلێڵ؛ دڵ‌پیس؛ خانەگومان؛ دڵ‌کرمن؛ دڵ‌کرمۆڵ؛ خاوەن هەڵسەنگاندنی خراو یان شێواو لەمەڕ کەسێ یان ڕووداوێکەوە.

**بدگمانی** / badgomānî، ـها/: *اسم.* دڵ‌چەپەڵی؛ بەدگومانی؛ خانەگومانی؛ دوودڵی؛ دڵ‌پیسی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەدگومان بوون ‹بدگمانی او نسبت به شوهرش زندگی زناشوییشان را خراب کرد: دڵ‌چەپەڵی بەرانبەر بە شووەکەی ژیانی هاوبەشییانی تێکدا›.

**بدگو** / badgû، ـها؛ ـیان/: *اسم.* خراپەبێژ؛ بەدگۆ؛ بەدواچ (بۆ نێر)؛ بەدواچە (بۆ مێ)؛ بەدزوان؛ کەسێ کە بەدگۆیی دەکات.

**بدگوشت** / badgûšt/: *صفت.* ١. *[مجازی]* گۆشتاڵ؛ نمرچ؛ بێ‌مەک ‹مدیرمان مردی نچسب و بدگوشت بود: بەرپرسەکەمان پیاوێکی نالەبار و گوشتاڵ بوو› ٢. بەوگۆشت؛ گۆشت‌خراپ؛ پێچەوانەی خۆش‌گۆشت؛ خێوەندی گۆشتێک کە لە بەرانبەر زام یان برینەوە درەنگ خۆش دەبێتەوە ‹بچەام خیلی بدگوشت است و زخمش بە این زودی خوب نمی‌شود: منداڵەکەم زۆر گوشت‌خراپە و زامەکەی بەم زوانە خۆش نابێتەوە› ٣. چەق؛ چەقەگۆشت؛ نەکوڵ ‹مرغ خیلی بدگوشت بود: مریشکەکە زۆر چەق بوو›.

**بدگوهر** / badgowhar, -go:har/: *صفت. [ادبی]* نانەجیب؛ نارەسەن؛ ناجسن؛ ڕەسەن‌خراو؛ دژهێم؛ خاوەن نژاد، دایک و باوک یان تایبەتمەندیگەلی خراپ لە دایک و بابەوە.

**بدگویی** / badgûyî، ـها/: *اسم.* فڕ: ١. خراپەبێژی؛ کار یان ڕەوتی فڕ پێدادان؛ قسە وتن لە بارەی خراپەی کەسێ یان شتێکەوە ٢. ئەو قسانەی کە لەو بارەوەن.

**بدل** [1] / badal، ـها/: [عربی] *اسم.* ١. بەدەڵ؛ ئەو کەسەی لە هەندێ دیمەنی فیلمدا لە جێی گەمیار دەور دەگەڕێنێ ٢. ☜ **همنیشین-٣**

**بدل** [2]: *صفت.* ١. زڕ؛ زڕە؛ ناجسن؛ تەخلیت؛ سهرک؛ سهر؛ زەغەل ‹طلای بدل: زڕە زێو› ٢. بەدەڵ؛ بەدەڵکار ‹هنرپیشەی بدل: گەمیاری بەدەڵ›.

**بدل‌چینی** / badalčînî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* سواڵەت؛ سرامیک؛ سواڵک؛ کاڵۆت؛ فراقامان؛ فەغفووری؛ فەرفووری.

**بدلعاب** / badlo'āb/: [فارسی/ عربی] *صفت. [مجازی]* پۆرخز؛ چەمووش؛ قۆڕ؛ ئاکار ناحەز.

**بدل‌کار** / badalkār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* بەدەڵ‌کار؛ کەسێ کە لە دیمەنگەلی دژوار و پڕمەترسی فیلمدا لە جێی گەمیار کایە دەکا.

**بدل‌کاری** / badalkārî/: [عربی/ فارسی]

/اسم. بەدەڵ‌کاری؛ کاری بەدەڵ‌کار.

**بدلی** / badalî، ـها/: [عربی] صفت. خەرش؛ بەدەڵ؛ زڕ؛ زڕە؛ متە؛ فرش؛ بە ویکچوونی ڕواڵەتی، بەلام بە شێوەیەکی نزمتر.

**بدمذهب** / badmazhab، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. بەدمەزەب؛ لامەزەو؛ بێ‌ئوول؛ خاوەن دین، ڕێباز یان ئایینێکی ناشایست و نەبار لەگەڵ نەریتی کۆمەڵگادا.

**بدمصب** / badmassab، ـها/: (!) [فارسی/از عربی] صفت. [گفتاری] لامەزەو؛ لامەسەب؛ بێ‌ئوول.

**بدمنصب** / badmansab/: [فارسی/ عربی] صفت. خاوەن ڕێ‌وڕەوشتی نەگونجاو و نالەبار بە بۆنەی دەسکەوتنی پلە و پایەوە.

**بدن** / badan، ـها؛ أبدان/: [عربی]/اسم. تەن؛ لەش؛ کەلەخ؛ کەلەستە؛ بەدەن؛ پەیکەر؛ قاڵب؛ جەستە؛ ئەندام؛ جەسە؛ سوێس: ۱. بەشی سەرەکی و بنەمایی قاپۆرەی گیانەوەر کە سەر و دەست و پێیانی پێوە لکاوە ۲. گۆدە؛ گۆڤدە؛ پەیکەری مرۆ لە ملەوە بەرەو خوار.

**بدنام** / badnām/: صفت. ناوزڕاو؛ ناوزڕیاگ؛ بەدنێو؛ بەدناو؛ ناڤنۆ؛ نامڤەت؛ بەناو و ناوبانگی خراپەوە ‹کودتاگران افرادی بدنام بودند: کوودەتاگێڕان کەسانێکی ناوزڕاو بوون›.

**بدنامی** / badnāmî، ـها/: اسم. ناوزڕاوی؛ بەدناوی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی ناڤنۆ بوون.

**بدن‌سازی** / badansāzî، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. [ورزش] بەدەنسازی؛ کار یان ڕەوتی بار هێنان و جوان و بەرهەڤ کردنی لەش لە سۆنگەی وەرزشەوە.

**بدن‌نما** / badan.nemā/: [عربی/ فارسی] صفت. ۱. لەش‌نوێن؛ لەش‌شاندەر؛ تەنک یا تەنگ یان زۆر دیودەر، بە چەشنێ کە لەش لە پشتەوەی دیار بێ (سەبارەت بە جل و بەرگ و پارچەوە) ۲. باڵا نوێن (بۆ ئاوێنە).

**بدنه** / badane، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. جووک؛ قاپۆرە؛ قاپۆر؛ قاپۆڕ؛ قەوارە؛ قەدپۆژ؛ قاپلۆخ؛ قابلۆخە؛ قراپوو؛ قولاخ؛ قاوغ؛ قالک؛ قورم؛ بەرگ؛ ڕووی دەرەوەی شتێک بەتایبەت بەشی پتەوی ‹بدنەی بخاری: قاپۆرەی سۆپا› ۲. [سیاسی] پەیکەر؛ چوارچێوە؛ بەشێ لە دامەزراوەیێک کە لە سۆنگەی بەڕێوەبەران و بەرپرسیارانەوە بەڕێوە دەچێ ‹بدنەی حزب: پەیکەری حیزب›.

**بدنهاد** / badnahād، ـان/: صفت. [ادبی] بەدنیهاد؛ دڵ‌چەپەڵ؛ دڵ‌پیس؛ دڵ‌گەن؛ بەدرا؛ زک‌ڕەش؛ هەناڤ‌ڕەش؛ دڵ‌خار؛ دڵ‌گەمار.

**بدنی** / badanî/: [عربی] صفت. بەدەنی؛ جەستەیی؛ جسەیی؛ کەلەستەیی؛ ئەندامی؛ لەشی؛ لەشیانە؛ لەشین؛ لەشینی؛ پێوەندیدار یان تایبەت بە لەش.

**بدو** / badv/: [از عربی]/اسم. سەرەتا؛ هەوەڵ.

◙ **بدو امر**: سەرەتای کار؛ هەوەڵی کار.

**بدو** / bedû/: ضمیر. [ادبی] بەو؛ بە ئەو؛ بەوە؛ پادی (بۆ نێر)؛ پادێ (بۆ مێ)؛ پانەیە (بۆ نێر)؛ پانێ (بۆ مێ) ‹بدو گفت: بەوی گوت›.

**بدو** / bodo/: صفت. [گفتاری] گورجوگۆڵ؛ کرژوکۆڵ؛ چوست و چەلەنگ؛ بزۆز؛ بڕۆ؛ کرژ؛ لۆپت؛ لۆتەر؛ بە گوڕ لە هاتوچۆدا؛ هەلینگاوە ‹یک آدم بدو می‌خواهد کە دنبال کار را بگیرد: کەسێکی گورج‌وگۆلی دەوێ لە دووی کارەکە کەوێ›.

**بدوا** / badvan/: [عربی] قید. [ادبی] لە سەرەتاوە؛ سەرەتا؛ وەڵێنە؛ لە هەوەڵەوە ‹بدوا لازم است موضوع روشن شود: لە سەرەتاوە پێویستە مەبەستەکە ڕوون ببێتەوە›.

**بدوـبدو**[1] / bodo.bodo، ـها/: اسم. [گفتاری] ۱. غارغارێن؛ ڕاوڕاوان؛ ڕەمەڕەمالێ؛ خارخارانی؛ کار یان ڕەوتی ڕاکردن و ڕانەوەستان ۲. ڕاکەڕاکە؛

هەڵکوت-هەڵکوت؛ تێزە-تێزە ‹تمام روز کارم شده بود بدو- بدو: تەواوی ڕۆژ کارم ببوە ڕاکە-ڕاکە›.

**بدو- بدو**[2]: قید. [گفتاری] پەلە-پەل؛ بریو-بریو؛ هەڵات-هەڵات؛ هەڵەداوان؛ پەلەپاتۆر؛ لەزبەلەز؛ تێزە-تێزە؛ ڕەمە؛ ڕەماڵی؛ خارخارانی؛ گوێ‌پچڕ-گوێ‌پچڕ؛ بەل-بەل؛ بە پەلە؛ بە خێرایی؛ بە توندی؛ بە لەز؛ بە غاردان ‹بدو- بدو رفتم اداره: بەلەپەل چوومە مەزرینگەوە›.

**بدوبیراه** / bad-o-bîrāh، ـها/: اسم. [گفتاری] جنێو؛ جوێن؛ دژمێن؛ دژمانی؛ خۆسن؛ ناسزا؛ کەنزە.

**بدون** / bedûne/: حرف. بێ؛ بەبێ؛ واتەی نەرێنی ‹بدون تو: بی‌تۆ›.

**بدوی**/ badavî ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. ١. ڕەوەند؛ کۆچەر ‹اقوام بدوی: خێڵە ڕەوەندەکان› ٢. سەرەتایی؛ سەرەتایین؛ هەوەڵی؛ ئەوەڵی؛ بەری ‹دادگاه بدوی: دادگای سەرەتایی›.

**بده**[1] / bede(h)/: اسم. [گفتاری] وەدە؛ ئەو بەرهەمەی لە کاتێکی دیاریکراودا لە شتێک دەس دەکەوێ ‹بده چاه آب کم شده: وەدەی بیرەکە کەم بۆتەوە›.

**بده**[2]: صفت. [گفتاری] بدەر: ١. دەهندە؛ بەخشندە؛ دلاوا؛ دەستندە؛ دەس‌ودڵباز ٢. بدەر؛ بە ویست یان خوازەی دانی شت ‹او پول بده نیست: ئەو پارە بدەر نیە›.

**بدهکار** / bedehkār، ـها؛ ـان/: صفت. قەرزدار؛ قەرزار؛ وامدار؛ ڤادار.

**بدهکاری** / bedehkārî، ـها/: اسم. قەرزداری؛ قەرزاری؛ وامداری ‹بدهکاری او را از پای درآورد: قەرزداری ڕیشەی دەرهێنا›.

▣ **بدهکاری بالا آوردن**: خۆ قەرزدارکردن؛ قەرز بارهێنان؛ بوونە ژێر قەرزەوە.

**بدەوبستان** / bede(ho)bestān، ـها/: اسم. [گفتاری] ١. دان و سان؛ ئاڵ و وێر؛ دا و ستەد؛ مامەڵە؛ سەودا ٢. [مجازی] کەین و بەین؛ پەیوەندی؛ نێوان ‹می‌گفتند با سفارت بدەوبستان دارد: دەیانگوت لەگەڵ باڵوێزخانەدا کەین‌وبەینی هەیە›.

**بدهی** / bedehî، ـها/: اسم. قەرز؛ قەرزداری؛ ئەو پارەیە بە ئەمانەت وەرگیراوە و دەبێ بدرێتەوە بە خاوەنی ‹جمع بدهی شما می‌شود هزار تومان: سەرجەمی قەرزتان دەبێتە هەزار تمەن›.

**بدی** / badî، ـها/: اسم. بەدی؛ خراپی؛ خراوی؛ خەراوی: ١. نەباشی؛ خراپی؛ گەنی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خراپ بوون ‹اینجا به آن بدی هم که می‌گفتند نیست: ئێرەش بەو خراپیەکە دەیانگوت نیە› ٢. [مجازی] ئازار؛ نارەوا؛ ستەم ‹من خیلی به او بدی کردم: زۆر لەگەڵ ئەودا خراپم کردووە›.

▣ **بدی دیدن**: خراپە دیتن؛ خراپە هاتنە ڕێ ‹بدی بکنی بدی می‌بینی: خراپە بکەی خراپە دەبینی›.

**بدی کردن**: خراپەکردن؛ کاری نارەوا کردن.

**بدیشان** / bedîšān/: ضمیر. [ادبی] بەوان؛ بە ئەوان؛ پا دیشا؛ بە ئادیشا.

**بدیع**[1] / badî'/: [عربی] اسم. ڕەوان‌بێژی؛ هونەری ڕازاندنەوەی قسە.

**بدیع**[2]: صفت. نۆ؛ تازە؛ خێوەندی دانستەی نوێ و (زۆرتر) خۆش کە لەوەبەر نەبووە ‹کار بدیع؛ چشم‌انداز بدیع: کاری نوی؛ بەرژەوەندی تازە›.

**بدیل** / badîl/: [عربی] اسم. [ادبی] جێ نشین؛ جێگر؛ جێگرەوە؛ یاگەگیر.

**بدیمن** / badyomn/: [فارسی/ عربی] صفت. ناپیرۆز؛ بەوفەڕ؛ بەویومن؛ قۆشمە؛ قۆشە؛ نەحس؛ نامبارەک؛ بەدهۆرم.

**بدین** / bedîn، ـان/: صفت. [ادبی] بەم؛ بە

ئەم؛ وەم؛ وە ئەم؛ پێ ‹بدین مژده گر جان فشانم رواست: بە ئەم موژدەیە گیان بەخت کەم حەقە›.

**بدیهه** / badîhe/: [عربی]/اسم. ۱. *[نامتداول]* لەنەکاو؛ گوزوگومبەت؛ یەکهەو؛ کتووپڕ؛ کوتوپڕ؛ ڕووداوی لەپڕ و چاوەڕوان نەکراو ۲. هاتە؛ قسە یان بیرێک کە لەنەکاو بە مێشکدا بێ ‹بدیهه گفتن: هاتە بێژی›.

**بدیهه‌سازی** / badîhesāzî، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. سەرپلکی چێ‌کری؛ کار یان ڕەوتی دروست کردنی ئاسەوارێکی هونەری (هەڵبەست، ئاهەنگ، ئاواز و...) بێ بیرکردنەوە و تێڕامان. هەروەها: **بدیهه‌نوازی**

**بدیهه‌گویی** / badîhegûyî، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. سەرپلبێژی؛ هاتەبێژی؛ کار یان ڕەوتی وتنی شیعر یان وتەیێکی لەبار هاوکات لەگەڵ ڕووداوێکی لەناکاودا.

**بدیهی** / badîhî/: [عربی] صفت. ئاشکرا؛ ڕوون؛ خوویا؛ دیار؛ ڕۆشن؛ وەرچەم؛ گونجاوی تێگەیشتن، بە بێ‌هەڵسەنگاندن و بیرکردنەوە ‹بدیهی است که از مهر فرزند نمی‌توان گذشت: ئاشکرایە کە خۆشەویستی منداڵ چاوپۆشی لێ ناکرێ›.

**بدیهیات** / badîhîyyāt/: [عربی]/اسم. چەمکان و کار و بارانێ کە بە هاسانی لێی تێبگەن.

**بذر** / bazr، ـها؛ بذور/: [عربی]/اسم. توو؛ تۆم؛ تۆوی؛ توخم؛ تۆڤ؛ منج؛ نسک؛ دنک؛ دەنک؛ دانە.

▣ بذر اصلاح شده: تۆوی چاک کراو؛ تۆمی بە زانست دەست لێدراو بۆ بەرهەمی باشتر.

▣ بذر چیزی را پاشیدن/ افشاندن: *[مجازی]* تووی شتێ چاندن؛ تۆمی شتێ وەشاندن؛ تۆوی شتێ داخستن؛ تۆم چتێ کێلان؛ شتێ ڕەواج دان ‹آنان در میان مردم بذر تفرقه را می‌پاشیدند: ئەوان لە نێوان خەڵکدا تووی دووبەرەکیان دەچاند›.

**بذرافشان** / bazrafšān، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. *[کشاورزی]* تووچن؛ تۆموەشێن؛ تۆمێن؛ تۆوچێن؛ تۆمشان؛ دەزگا یان ئەو کەسەی کە توو دەوەشێنێ: **بذرپاش**

**بذرافشانی** / bazrafšānî/: [عربی/ فارسی] اسم. تووچینی؛ کارتش؛ کارتەن؛ کار یان ڕەوتی توو داچاندن؛ تۆم وەشانن؛ دان وەشاندن؛ تۆمپێدانی زەوی؛ تۆم شانەی: **بذرپاشی**

**بذرپاش** / bazrpāš/: [عربی/ فارسی] ☜ **بذرافشان**

**بذرپاشی** / bazrpāšî/: [عربی/ فارسی] ☜ **بذرافشانی**

بذرک / bazrak/ ☜ **بَزرک**

**بذرکار** / bazrkār، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. تووچێنەر؛ تۆموەشێن؛ کەرەسەیەکە کە بە هێزی وەرزێر، ئاژەڵ یان موتۆرەوە کار دەکا و پاش درنەدانی شیوەرد، تۆمەکە دەچێنێت و بە گردێنێ سەری دادەپۆشێ.

**بذل** / bazl/: [عربی]/اسم. بەخشش؛ خێرات؛ کار و ڕەوتی لە خۆ جیاکردنەوە و دان بە کەسێکی تر.

▣ **بذل توجه**: ورد بوونەوە؛ تێ‌ڕوانین: **بذل عنایت**

بذل عنایت ☜ **بذل توجه**

بذل مساعی: تێکۆشان؛ کۆشت؛ تەپشت؛ پەل‌وپۆ؛ کردوکاش؛ کردوکۆش؛ هەوڵ‌وتەقالا؛ هەڵگ.

**بذله** / bazle/: [از عربی ؟]/اسم. *[ادبی]* حەلک؛ قسەی‌خۆش؛ حەنەک؛ جەفەنگ؛ گۆنگل؛ قسەی‌گاڵتە و گەپ.

**بذله‌گو** / bazlegû، ـها؛ ـیان/: [از عربی/

فارسی] *صفت.* قسەخۆش؛ قسەخوەش؛ شۆخ؛ کای کەردۆخ؛ حەنەکچی؛ چوولە؛ گاڵتەباز؛ گاڵتەچی؛ چەکە؛ سیقاف؛ حەنەکبێژ؛ خاوەن توانایی یان ئۆگرەتی بە قسەی گاڵتە و گەپ.

**بذله‌گویی** / bazlegûyî، ـها/: [از عربی/ فارسی] *اسم.* حەنەکبێژی؛ چوولەیی؛ کار یان ڕەوتی قسەی خۆش کردن.

**بذور** / bozûr/: اعربی] جمعِ ☜ **بَذر**

**بـر**[1] / bar/:*اسم.* ۱. *[ادبی]* شان ‹بر و بازو: شان و باهۆ› ۲. *[نامتداول]* بەر؛ بەرە؛ وەر؛ میوە؛ باهر؛ بەرهەم ۳. بەر؛ وەر؛ پێش؛ بەردەم؛ شوێنی نێوان بوار یان پیادەڕەو و ماڵ ‹برِ خیابان: بەری شەقام› ٤. بەر؛ وەر؛ لا؛ لۆ؛ گۆشە ‹دو بَر: دوو بەر› ٥. *[قدیمی]* باوەش؛ ئامێز؛ واشی ‹پدر تنگ بگرفت اندر برش: باوکی توند گرتیە نێو باوەشی› ٦. *[قدیمی]* پاڵ؛ پەراسوو؛ پەل.

▣ **در بر کردن** ☜ **در**[2]

**بر**[2]: *قید. [ادبی]* ۱. له بان؛ لە سەر؛ بە؛ سەروو ‹بر سر درخت: لە سەر دار› ۲. بەردەم؛ بەر؛ وەر؛ وەروو؛ لە بەر؛ نوا ‹بر در خانە: لەبەر دەرکی ماڵ› ۳. تەنیشت؛ پاڵ؛ لا ‹در بر او نشست: لە تەنیشتیەوە دانیشت›.

▣ **در برداشتن** ☜ **در**[2]

**در برگرفتن** ☜ **در**[2]

**بر**[3]: *حرف. [ادبی]* ۱. لە سەر؛ پێتی ئەرێنی و پێویستی ‹احترام او بر ماست: ڕێزگرتنی لە سەرمانە› ۲. بە سەر؛ پێتی بەرهەڵستی ‹از ماست کە بر ماست: لە ئاکاری خۆمانە، هەرچی بە سەرماندا دێ›.

**بر**ـ[4]: *پیشوند.* ۱. هەڵـ ؛ هۆر ـ ؛ هەل ـ ؛ هل ـ ؛ ـ رە؛ بەرەوبان ‹برافراشتن: هەلدان› ۲. دا ـ ؛ ئەرە ـ ؛ ـ رە؛ لا؛ بەرەوژێر ‹برافکندن: داخستن› ۳. دا ـ ؛ ئەرە؛ لە سەر شتێ ‹برنشستن: دانیشتن› ٤. بە؛ پێک ـ ؛ پێوە ـ ؛ بە یەکتری ‹بربستن: پێوە بەستن› ٥. بەر ـ ؛ وەر ـ ؛ ناوساز ‹برنامە: بەرنامە› ٦. بەر؛ هەڵـ ؛ هۆر؛ خاوەن دۆخ یان چۆنیەتیەک ‹برگزیدە: هەلبژاردە›.

ـ **بر**[5]: *پیواژە.* ـ بەر؛ هەڵگر ‹باربر: بارەبەر›.

**بـر** / bar(r)/: اعربی]*اسم.* ۱. وشکانی؛ وشکی؛ هشکاتی؛ بەر؛ ئیشکانی؛ برینگ؛ قاقڕ؛ کڕاڵ؛ وشکارۆ ۲. *[جغرافیا]* بەژ؛ قارە؛ قۆڕنە؛ قوڕنە.

▣ **بر جدید**: بەژی نوێ (ئەمریکا، ئوستralیا و بەژی باشوور): **دنیای جدید**

**بر قدیم**: بەژی کۆن (ئاسیا، ئورووپا و ئەفریقا): **دنیای قدیم**

**بُـر**[1] / bor/:*اسم.* ۱. بڕ؛ کار یان ڕەوتی تێکەڵ کردن (زاراوەی پاسوورکردن) ‹بُر زدن: بر دان› ۲. ☜ **بُورۆن**

▣ **بُر خوردن**: بڕخواردن؛ قاتی بوون؛ تێکەڵ بوون؛ ئاوێتە بوون: ۱. تێکەڵاو بوون ‹ورقها خوب بُر خورد؟: پاسوورەکان باش بریان خوارد؟› ۲. درنە واردەی؛ چوونە نێو دەستە یان ئاپۆرەیێکەوە ‹آزاد هم با دانشجویان بُر خورد و رفت توی دانشگاه: ئازادیش تیکەڵی قوتابیەکان بوو و چووە نێو زانستگاوە›.

**بُر زدن**: تێکەڵ کردن؛ ئاوێتە کردن: ۱. بڕ لێدان ‹ورقها را حسابی بُر بزن: پاسوورەکان باش بڕ لێدە› ۲. درنە دەی؛ کردنە نێو ئاپۆرەیێکەوە ‹آزاد هم خودش را وسط دانشجویان بُر زد و رفت توی دانشگاه: ئازادیش خۆی تیکەڵی قوتابیەکان کرد و چووە نێو زانسگاوە›.

ـ **بُر**[2]:*پیواژە.* ـبڕ ‹آهن‌بُر: ئاسن‌بڕ›.

**برآسـودن** / barāsûdan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* حەسانەوە؛ حاوانەوە؛ حەوانەوە؛ پشوودان؛

پێشدان؛ وچاندان؛ ئەوەسیەی؛ سیایوە؛ ورین‌گرتن ‹لختی براسود: تۆزێ حەسایەوە›.

■ مصدر منفی: **برنَیاسودن** (نەحەسانەوە)

**برآشفتن** / barāšoftan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* // **برآشفتی:** هەڵچووی؛ **برمی‌آشوبی:** هەڵدەچی؛ -// تووڕە بوون؛ هەڵچوون؛ دەرهەڵبوون؛ هەڵشێوان؛ هەڵیڤان؛ رق هەستان؛ ڕک هەڵسان؛ قین هەڵسان؛ هۆرئامەی ‹از این سخن سخت براشفت: لەم قسەیە یەکجار تووڕە بوو›.

■ صفت مفعولی: **برآشفته** (هەڵچوو)/ مصدر منفی: **برنَیاشفتن** (هەڵنەچوون)

**برآمدگی** / barāmadegî، ـها/: *اسم.* زۆپی؛ قۆقزی؛ دەرپەڕیوی؛ هەڵبەزیوی؛ هەڵتۆقیوی؛ قەلپەیی؛ زەقایی؛ قوتی؛ هەڵماسیوی؛ بەرپڕایی؛ گتی ‹روی سرش دو تا برامدگی به اندازەی گردو دیده می‌شد: لە بان سەریەوە دوو زۆپی بە قەد گوێزێک دیار بوو›.

**برآمدن** / barāmadan/: *مصدر. لازم. متعدی. [ادبی]* // **برآمدی:** دەرهاتی؛ **برمی‌آیی:** دەردێی؛ **برآ:** دەربێ// □ *لازم.* ۱. هەڵاتن؛ هەڵهاتن؛ ئەڵاتن؛ بەرزەو بوون؛ کەوتن؛ کەوتەی؛ دەرکەوتن؛ دەرهاتن؛ وەدەرکەوتن؛ هۆرئامەی؛ زیەی؛ زیای؛ بەرئامەی ‹برامدن خورشید: هەڵاتنی خۆر› ۲. زۆپ بوون؛ هەڵماسین؛ هەڵتۆقین قنجبوونەوە؛ قیتەو بوون؛ زەرقین؛ ڤەیەنگزین □ *متعدی.* ۳. دەرهاتن؛ هاتنە بان؛ زیایرە؛ ئەرەزیەی؛ ئامەی بەر؛ هاتنە سەر ‹از چاه برامدن: لە چاڵ دەرهاتن› ٤. چوونە سەر ‹بر بام برامدن: چوونە سەر بان› ٥. هاتن؛ دەرهاتن؛ هەڵهاتن؛ تاوەی؛ توانین ‹از دست برامدن: لە دەس هاتن›. هەروەها: **برآمدنی**

■ مصدر منفی: **برنَیامدن** (دەرنەهاتن)

**برآمده** / barāmade/: *صفت.* گورگەپشت؛ زەق؛ زۆپ؛ زپ؛ هەڵتۆقیو؛ ڕەپ؛ زۆق؛ دەرپەڕیو؛ بەرپڕا؛ بەرپڕەی؛ گت؛ قیت: ۱. زەق‌دەرپەڕیو ‹پیشانی برامده: تەوێڵی زەق‌دەرپەڕیو› ۲. هەڵماسیو؛ ماسا؛ ماسەی؛ **هەڵتۆقیو** ‹شکم برامده: زگی هەڵماسیو›.

**برآورد** / barāvard، ـها/: *اسم.* قرس؛ خەمڵ؛ بەراورد؛ مەسێو؛ نەهان؛ فەرس؛ کار یان ڕەوتی قەرساندن؛ هەڵسەنگان؛ قەبڵان؛ قابلان؛ قەبلین؛ قەبەلاندن؛ دەرخستنی ئەندازەی شتێ ‹براورد فاصله: قرسی مەودا›.

**برآوردن** / barāvardan, barāvordan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **برآوردی:** دەرت هێنا؛ **برمی‌آوری:** دەردەهێنی؛ **برآور:** دەربهێنە// ۱. دەرهێنان؛ دەرێنان؛ دەرهاوردن؛ بەرئاردەی ‹از چاه براوردن: لە چاڵ دەرهینان› ۲. بەجێ‌هێنان؛ ئەنجامدان؛ بوارا کردن؛ بەگا ئاردەی؛ مەشاندن؛ کودانن؛ پێک‌هێنان؛ جێبەجێ‌کردن ‹خواستەی کسی را براوردن: داوای کەسێ بەجێ‌هینان›. هەروەها: **برآوردنی**

■ مصدر منفی: **برنَیاوردن** (دەرنەهێنان)

**بُرا** / borrā/: *صفت. [گفتاری]* ۱. بڕندە؛ بڕ؛ تیش؛ تیژ؛ تێژ؛ بەبڕشت؛ هەبوونی هێزی بڕین ۲. *[مجازی]* بەبڕشت ‹لحن بُرا: دەنگی بەبڕشت›.

**برائت** / barā'at/: [عربی] *اسم.* ۱. پاکانە؛ بێ‌تاوانی؛ ڕەڤین؛ ڕەوینە؛ دۆخ یان چۆنیەتی پاک بوون ۲. قەڵسی؛ وەڕەزی؛ جاڕزی؛ بێزاری؛ وێڕسی؛ وەڕستی ۳. پەژیوانی؛ پەشیمانی؛ پاشگەزی؛ تۆبە.

▣ **برائت ذمه:** ڕەوتی لەکۆڵ‌کەفتن؛ لەکۆڵ بوونەوە؛ لەمل‌بوونەوە؛ پاک لە پاک بوون؛ ڕەوینەوە لە وام یان وەخۆگری.

**برابر** / barābar/: *صفت.* هەمبەر؛ هومبەر؛ ڤەراڤەر؛ هەنداڤ؛ هەنداو؛ بەرامبەر؛ بەرانبەر؛ داربەدار؛ بەرابەر؛ هەڤشەر: ۱.

ڕووبەڕوو؛ هەڤبەر؛ هاوبەر؛ وەراوەر؛ وارانوەر؛ ڕوی‌بەڕوی؛ ڕوولەڕوو؛ مەشلاق؛ مێزین؛ جێگایێک کە ڕوو یان ڕوانینی تێوەیە ‹من درست در برابر سخنران نشسته بودم: من ڕێک لە بەرانبەری وتاربێژەکەوە دانیشتبووم› ٢. وەکوو یەک؛ وەک‌هەڤ؛ چوون‌یەک؛ وەک‌هەو؛ بارتوقا؛ بارتەقا؛ سەربەسەر؛ هاوتەرازوو؛ هاوتەراز؛ چۆبەچۆ؛ قات‌بەقات؛ هاوسەنگ؛ بە چەندیەتی و چۆنیەتی یەکسانەوە ‹همه با هم برابرند: هەموو پێکەوە بەرابەرن›.

▣ **دو برابر**: دوو بەرانبەر؛ دوو بەرامبەر؛ دوو ئەوەندە. هەروەها: **سه برابر؛ چند برابر**

▣ **برابر بودن**: بەرابەر بوون؛ هەمبەر بوون؛ هاوسەنگ بوون؛ بە چەندیەتی یان هەبوونی دۆخێکی یەکسانەوە. هەروەها: **برابر شدن؛ برابر کردن**

**برابری** / barābarî، ـها/:/اسم. بەرامبەری؛ بەرابەری؛ وەک‌یەکی؛ هاوسانی؛ یەکسانی؛ بار و دۆخی هاوسان بوون ‹برابری مردم در برابر قانون: بەرامبەری خەلک لە هەمبەر قانوونەوە›.

**برات** / barāt، ـها؛ بَرَوات/: [از عربی]/اسم. بەرات؛ بەلگەیەک کە لە سۆنگەی ئەوەوە کەسێ لە کەسێکی‌تر دەیەوێ کە لە کاتێکی دیاریکراودا پارەیەک بدا بە شوێنێ یان کەسێک.

▣ **برات اسنادی**: بەراتێک کە بەلگە یان بارنامەیێکی لەگەڵدایە کە قەرزی بەراتگر پیشان دەدا.

**برات دیداری/ رؤیت**: بەراتێک کە وەرگر دەبێ دەسبەجێ پارەکەی بدا: **برات عندالمطالبه**

**برات سازشی**: بەراتێ کە بەهۆی پێکهاتنی دوو یان چەند بازرگان بۆ گرتنی پارە لە بانکەوە بەدیهاتووە.

**برات سفید**: بەراتێ کە ناوی بەراتگری لێ نەنووسراوە و دەکرێ لە هەموو بانکێکدا بەکار ببرێت.

**برات عندالمطالبه** ☜ **برات دیداری/ رؤیت**

▣ **برات شدن به دل کسی** ☜ به دل کسی برات شدن، **دل**

**برات کردن**: بەرات ناردن؛ ناردنی بەرات بۆ کەسێ.

**براتکش** / barātkeš، ـها/: [از عربی/ فارسی] /اسم. بەراتنووس؛ کەسێ کە بەرات دەنووسێ تا پارەیەک لە بەراتگر وەربگیردرێت.

**براتگیر** / barātgîr، ـها/: [از عربی/ فارسی] /اسم. بەراتگر؛ کەسێ کە بەرات بە ناو ئەوەوە دەردەچێ و لێی دەخوازرێ تا پارەیەک بخاتە حەساو بە بەراتکێش.

**برادر** / barādar، ـها؛ ـان/:/اسم. برا؛ برار؛ برێ؛ ورا؛ برالە: ١. ئابرا؛ نێرینەی گیاندار (بەتایبەت ئینسان) هاو دایک و باوک یان هەریەک لەوان (دایک یان باوک) ‹آرام برادر آزاد و مریم است: ئارام برای ئازاد و مریەمە› ٢. کاکە؛ کاکەبرا؛ برالە؛ برادەر؛ کاورا؛ کابرا؛ کاک‌برا ‹ای برادر! ما به گرداب اندریم: کاکە! ئێمە وا لەنێو گێژاوەداین›.

▣ **برادر تنی**: برای تەنی؛ برێ‌ڕاستی؛ برای دایک و باوکی.

**برادر دوقلو**: برادوانە؛ گیاندارێکی نێرینە کە لەگەڵ گیانداری‌تردا پێکەوە هاتوونەتە دنیاوە ‹شاه برادر دوقلوی اشرف بود: شا برادوانەی ئەشرەف بوو›.

**برادر دینی**: برای دینی؛ پیاوی هاودین.

**برادر رضاعی/ شیری**: برای شیری؛ برای هاڤشیری؛ نێرینەیەک کە لەگەڵ یەکێکی‌تردا ژنێک شیری دابێتن.

**برادر ناتنی:** زڕبرا؛ برای ناتەنی؛ براماک؛ برای هەر لە باوک یان هەر لە دایک: **نابرادری**

**برادرانە** [1] / barādarāne/: *صفت. [مجازی]* برایانە؛ برادەرانە؛ ئابرایانە ‹رفتار برادرانە: ئاکاری برایانە›.

**برادرانە** [2]: *قید.* برایانە؛ برادەرانە؛ برائاسا؛ وەک برا ‹او را برادرانە نصیحت کرد: برایانە ئامۆژگاری کرد›.

**برادرخواندە** / barādarxānde، ـها/: *اسم.* برای هەڵبژاردە؛ کوڕ یان پیاوێک کە یەکێکی‌تر ناوی برای خۆی لێ نابێ.

**برادرزادە** / barādarzāde، ـها؛ ـگان/: *اسم.* برازا؛ برازی؛ برازاگ؛ برازاو؛ برارزا؛ فرزەندی برا؛ زارۆی برا.

**برادرزن** / barādarzan، ـها/: *اسم.* ژن‌برا؛ ژن‌ورا؛ ژەن‌برا؛ برای هاوسەری پیاو.

**برادرشوهر** / barādaršowhar, -šo:har، ـها/: *اسم.* هێوەر؛ شوورا؛ برای مێرد/ شوو.

**برادروار** / barādarvār/: *قید.* برایانە: ١. وەک برا؛ برادەر ئاسا ‹رفتارشان برادروار بود: ئاکاریان برایانە بوو› ٢. *[مجازی]* برادەرانە؛ زۆر گەرم و گوڕ و دۆستانە ‹برادروار او را در آغوش گرفت: برایانە گرتیە باوەشەوە›.

**برادری** [1] / barādarî/: *اسم.* برایی: ١. برایەتی؛ برایی؛ براری؛ دۆخ یان چۆنیەتی برا بوون ‹اول برادری‌ات را ثابت کن بعد ارث بخواه: سەرەتا برایەتیت نیشان بدە ئەوجار داوای میرات بکە› ٢. دلۆڤانی؛ دڵسۆوانی؛ دۆستی یان هاودڵی زۆر لە لایەن پیاو یان پیاوانی هاوتەمەنەوە ‹در حق من برادری کرد: لەگەڵ مندا برایی کرد›. هەروەها: **برادری کردن**

**برادری** [2]: *صفت.* برایی؛ برایەتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە براوە ‹احساس برادری: هەستی برایەتی›.

**برادە** / borāde، ـها/: *[عربی]/اسم.* خاکەمرمەند؛ وردە؛ گەردە؛ بڕە؛ ورتکە؛ وردە و خاکەی کانزا ‹برادەی آهن: ورتکەی ئاسن›.

**برازاندن** / barāzāndan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **برازاندی:** کالاندتەوە؛ **می‌برازانی:** دەکاڵێنیەوە؛ **ببرازان:** بکاڵێنەوە// کالاننەوە؛ کالاندنەوە؛ شیاوی کەسێ یان شتێ کردن.

**برازندگی** / barāzandegî/: *اسم.* کالانەوە؛ پێ‌کەوتوویی؛ لەباری؛ لێ‌ئانیەتی؛ شیاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شیاو بوون.

**برازندە** / barāzande/: *صفت.* شیاو؛ شیانست؛ شایان؛ لەبار؛ لێهاتوو؛ لێهاتی ‹جوان برازندەای است: لاوێکی لەبارە›.

**برازیدن** / barāzîdan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* شیان؛ لێهاتن؛ لێ‌کالان؛ لێ‌جوان بوون؛ لێ‌ئانین؛ پێ‌کەفتن؛ شیاو بوون ‹این پیراهن به شما می‌برازد: ئەم کراسەتان لێ‌دەکالێتەوە›.

**براستی** / berāstî/: *قید.* بەڕاستی؛ بەڕاس؛ بێ‌قسەی؛ وشەی پێ‌داگری ‹وقتی بە آنجا رسیدم او براستی مردە بود: کاتێ کە گەیشتمە ئەوێ بەراستی مردبوو›.

**براعت‌استهلال** / barā'ate'estehlāl/: *[عربی] اسم. [ادبی]* دەسپێکانە؛ وەستایی و کارزانی لە دەسپێکرنی قسە و باسدا بە جۆرێ کە بیسەر باش ببێتە تامەزرۆی زانینی مەبەست و تێگەیشتنی هەستی وێژەر.

**برافتادن** / baroftādan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* // **برافتادی:** هەڵپێچیای؛ **برمی‌افتی:** هەڵدەپێچی؛ **بربیفت:** هەڵپێچە// هەڵپێچان؛ هەڵپێچانەوە؛ هۆرپێچیەی: ١. رووخان؛ تێکچوون؛ لەدەسدانی پلە و پایە؛ بەربوونەوە ‹برافتادن مادها: هەڵپێچانەوەی مادەکان› ٢. *[گفتاری]* ترۆ بوون ‹بۆ داهات و

یان شتێک ‹برای علی کتاب خریدم: بو عەلی کتێبم سەند› ۲. نیشانەی هۆکار ‹برای خریدن کتاب آمدام: بو سەندنی کتێب هاتووم›.

◙ **برای خود:** بۆ خۆ؛ ئەڕای خود؛ پەی وێ؛ پەرێ وێ؛ ژبۆ خوە: ۱. تایبەت بە کەسێکی ئاماژە پێکراو ‹برای خودت چه خریدی؟: بو خوت چیت کری؟› ۲. نیشانەی نارەزایەتی دەربڕین لە کارێک ‹برای خودت کردی که خریدی: بو خوتت کرد که کریت› ۳. نیشانەی پێداهەڵدان و پەسن‌کردن ‹تو برای خودت کسی هستی: تۆ بۆ خوت کەسێکی›.

**براىند** / barāyand، ـها/: /اسم. بەرهات؛ ئاکام؛ ئەنجام؛ بەرهەم و ئاکامی کار.

**برباد** / barbād/: قید. بەبا؛ بەرباد؛ بەربا؛ بێزەلەت؛ لەکەڵک و کارکەوتوو.

◙ **برباد بودن:** بەربا بوون؛ بەبا بوون؛ سست و لە تێکچووندا بوون ‹بیار باده که بنیاد عمر برباد است: مەی بێنە کە بنیادی ژیان بەربایە›.

**برباد دادن:** بەبا دان؛ بەدەم باوەدان؛ بەفیڕۆ دان؛ فوودەی؛ بە خۆڕایی لە کیس‌دان ‹ثروت پدرش را برباد داد: سامانی بابی بەبا دا›. هەروەها: **برباد رفتن؛ برباد شدن**

**بربادرفته** / barbādrafte/: صفت. بابردەڵە؛ بابردە؛ بابردوو؛ لەدەس‌چوو؛ بە فیڕۆچوو؛ هەڕشاو؛ هیچ بە سەر هیچەوە نەماو ‹عمر بربادرفته: ژیانی بابردەلە›.

**بربر**[1] / barbar/: [معرب از یونانی]/اسم. بەربەر: ۱. /ـها/ هەرکام لە خەڵکی خێڵی سپی پێستی باکووری ئەفریقا ۲. لقێ لە زمانگەلی ئەفریقی‌ـئاسیایی کە لەو ناوچەیانەدا باوە.

**بربر**[2] / ـها/: صفت. بەربەر؛ دەشتەکی؛ دوور لە شارستانیەت و فەرهەنگ.

**بر-بر** / ber(ro)ber/: قید./گفتاری/ زاق ـــ زاق؛ زیت-زیت؛ زل-زل؛ واق-واق؛ وڕ-وڕ ‹ایستاده بود و بر-بر مرا نگاه می‌کرد: ڕاوەستا بوو و زاق-زاق منی سەیردەکرد›: **بروبر**

◙ **بر ـــ بر نگاه‌کردن:** زاق ـــ زاق ڕوانین؛ زیت-زیت سەیرکردن.

**بربری** / barbarî، ـها/: اسم. بەربەری: ۱. جۆرە نانێکی ئێرانی ۲. /قدیمی/ هەرکام لە خێڵ یان هۆزی شیعە لە ئەفغانستان و خوراساندا.

**بربریت** / barbarîyyat/: [عربی]/اسم. بەربەریەتی: ۱. دۆخ یان چۆناوچۆنی دەشتەکی بوون؛ دووری لە شارستانیەت ‹در آن هنگام اروپا در بربریت به سر می‌برد: لەو کاتەدا ئەورووپا لە بەربەریەتیدا دەژیا› ۲. /ـها/ دڕندەخۆیی؛ دڕندەیی؛ دڕندایەتی ‹جنگ نشانه‌ای از بربریت انسانهاست: شەڕ نیشانەیێک لە دڕندایەتی مرۆڤە›.

**بربستن** / barbastan/: مصدر. متعدی. /ادبی/ //**بربستی:** پێچاتەوە؛ **برمی‌بندی:** دەپێچیەوە؛ **ببربند:** بپێچەوە// پێچانەوە؛ بەستن؛ پێکەوە نان؛ پێکنان؛ هۆڕپێتەی ‹بار سفر بربست: باری سەفەری پێچایەوە›.

■ صفت مفعولی: **بربسته** (وەپێچراو)/ مصدر منفی: **برنبستن** (نەپێچانەوە)

**بربط** / barbat، ـها/: [معرب از یونانی]/اسم. /قدیمی/ بەربەت؛ ئامێری مووسیقایی ژێدار بە کاسەی گەورە و دەسکی کورتەوە کە بە زەخمە و قامک دەژنرا و دوای ماوەیێک عوود ـ بە نەختێ گۆڕانکاریەوە ـ جێی گرتەوە.

**بربند** / barband/: /اسم. بەرەک؛ وەرەک؛ بەرۆک؛ سینەبەند؛ بەرملە؛ سیرمێک کە بە دەوری ملی ئەسپەوە ئالقە دەبێ و بە زینەوە دەبەسترێ.

**برپا**[1] / barpā/: صفت. ۱. دامەزراو؛ دایر؛

کراوه ‹مدرسه‌ها برپا شدند: قوتابخانه‌کان دابمزر بوون› ۲. بەرپا؛ هەرستاو؛ هەڵدراو ‹چادرشان برپا است: دەوارەکەیان هەڵدراوە›.

⊡ برپا کردن: هەڵدان؛ هۆردەی؛ نیانەوە؛ دامەزراندن.

برپا^۲: صوت. رابە؛ رابن؛ هەڵس؛ بەرپا؛ هەستن؛ فەرمانی هەستان. بەرانبەر: بَرجا

برپائی / barpā'î/ ☜ برپایی

برپایی / barpāyî/: اسم. رێخەری؛ کار یان رەوتی رێکخستن؛ سازاندن ‹برپایی تظاهرات: رێکخستنی خۆپیشاندان›.

برتافتن / bartāftan/: مصدر. لازم. متعدی. [ادبی] // برتافتی: هەڵتکرد؛ برمی‌تابی: هەڵدەکەی؛ برتاب: هەڵکە// هەڵکردن: ۱. □ لازم. تاقەت هێنان؛ دەرهێنان؛ بەرگە گرتن؛ تابشت هێنان ‹این ستم را برنتافت: لەگەڵ ئەم ناحەقیە هەڵنەکرد› ۲. □ متعدی. هەڵگەڕاندن؛ هەڵگەڕانن؛ وەرگەڕاندن؛ هۆرگێڵنەی؛ هۆرەوەگێڵنای؛ هەڵپێچاندن ‹روی برتافتن: روو هەڵگەڕاندن› ۳. بادان؛ وادەی؛ پێچدان ‹دست برتافتن: دەس بادان›.

هەروەها: برتافتنی

■ صفت فاعلی: برتابنده (هەڵکەر)/ صفت مفعولی: برتافته (هەڵکراو)/ مصدر منفی: برنَتافتن (هەڵنەکردن)

برتر / bartar/ ـها؛ ـان/: صفت. بەرتر؛ بانتر؛ پێشتر؛ سەرتر؛ وەرتەر؛ هەڤیاز ‹کیفیت برتر: چۆنیەتی بانتر›. هەروەها: برتر بودن؛ برتر داشتن؛ برتر دانستن؛ برتر شمردن

برتری / bartarî/ ـها/: اسم. هەڤیازی؛ بانتری؛ پێشتری؛ بەرتەری؛ وەرتەری؛ بەبژاری؛ دۆخ یان چۆنیەتی هەڤیاز بوون

⊡ برتری جستن: کەوتنە پێش؛ کەفتنە بەر؛ پێشەکی سەندن ‹آزاد در صدد برتری جستن بر همکلاسیهایش بود: ئازاد بە هیوای کەوتنە پێش لە هاوقوتابیەکانیەوە بوو›.

برتری دادن: بەچاکتر زانین؛ هەڤیاز کردن. هەروەها: برتری داشتن

برتری یافتن: بەرتر بوون؛ باشتر/ بانتر بوون؛ وەرتەر بیەی؛ هەڤیاز بوون.

برتنگ / bartang/: اسم. ۱. دەسرازە؛ دەستڕازە؛ دەسپێچەنێ؛ بەنێ کە بۆ بەرگری لە کەوتنی منداڵ لە بێشکەدا، بە دەوریەوە ئەیبەسن ۲. تەنگ؛ تەنگە؛ شاتەنگ؛ تەسمەیەک کە لە ژێر زگی ئەسپەوە ئاڵقە دەبێ و زینی بە سەر پشتدا دادەبەستێ.

برج / barc/ ـها/: اسم. [گفتاری، کنایی] بەرج؛ هۆرتە و بەرەی نابەجێ ‹اینها که تو می‌گویی خرج نیست، برج است: ئەمانە کە تۆ دەڵێی خەرج نیە، بەرجە›.

برج / borc/ ـها؛ بروج/: [معرب از یونانی] اسم. بورج؛ برج: ۱. کەلوو؛ قولە؛ قولکە؛ خانووە قوتکەی بان قەڵا ۲. کەلوو؛ هەر بینایەکی وەکوو بورج ‹برج آب: بورجی ئاو› ۳. کۆشک؛ خانووی زۆر بەرز (زۆرتر لە ۱۵ نهۆم) ٤. [نجوم] کەلوو؛ هەرکام لە ۱۲ وێنەی ئاسمانی: بُرج فلکی ۵. [قدیمی] هەرکام لە مانگەکانی هەتاوی کە لەو کەلووە ئاسمانیگەلەوە گیراوە.

⊡ برج آب: بورجی ئاو؛ مەنبەعی ئاو؛ دەفرێکی گەورە بۆ جێگەی ئاو لە بەرزاییدا.

برج آسمان: کەلوو؛ بورجی ئاسمان.

برج بابل: [کنایی] بورجی بابل؛ شوێنێ کە تێیدا هەموو تیرە و تایفەیەک بە زاراوە و دابونەریتی جۆراوجۆرەوە هەبێ.

برج تانک: بورجی تانک؛ کەلووی دەبابە؛ بەشێکی وەکوو بورج لە سەر تانکەوە کە تانکچی تێیدایە.

**برج تبرید** ☜ **برج خنک‌کننده**

**برج خنک‌کننده:** بورجی فێنک‌کەرەوە؛ بورجی فێنک‌کەرەوە؛ کەرەستەیەک وەکوو کەلوو کە ئاوی داخی تێدا فێنک دەبێتەوە: **برج تبرید**

**برج دودکش:** کلاوە؛ قۆلەکوورە؛ چوار دیوارە چکۆلەیەک بە دەوری کوناوەجەی باندا، بۆ دەرچوونی دووکەڵ.

**برج دیده‌بانی:** گۆیاری؛ برجی ئێشک‌گری قەلا.

**برج زهرمار:** *[تعریض]* گرژ و مۆر؛ ناوچاوتورشیاگ.

**برج سرطان:** گیڤژاڵە؛ بورجی قرژاڵ لە ئاسماندا.

**برج عاج:** *[کنایی]* گوێچکەی گا؛ بار و لۆرێکی دوور لە کار و باری ڕۆژانە و ئەرکی ژیان.

**برج فرودگاه:** بورجی فرگە؛ بورجی بەرزی فڕۆکەخانە کە تێدا فڕۆکەوانان بۆ نیشتنەوە و هەڵسانەوە ڕێگایان پێ دەدرێ: **برج کنترل**

**برج فلکی** ☜ **برج - ۴**

**برج قلعه:** کۆنگرە؛ قونگرە؛ بورجی لە سەر قەلا.

**برج کنترل** ☜ **برج فرودگاه**

**برج میزان:** ترازوو؛ مێزین؛ کۆمەڵە ئەستێرەیێکن لە ئاسماندا کە لە بەرچاو وەک ترازوو دەچن.

**برج ناقوس:** کەلووی ناقووس؛ بورجی سەربانی کلیسا کە ناقووسی تێیدایە.

**برجا**[1] / barcā/: *صفت.* سەرپا؛ ماو؛ ماگ؛ مەنە؛ مەنێ؛ بەردەوام؛ وەستاو؛ ڕاوەستاو؛ وەستاوە ‹آن بنا تا چند سال پیش برجا بود: ئەو بینایە تا چەن ساڵ لەمەو پێش سەرپابوو›.

**برجا**[2]: *صوت.* بەرجا؛ دانیشن؛ فەرمانێکە بۆ دانیشتن. بەرانبەر: **برپا**

**برج‌ساز** / borcsāz/، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] *اسم.* بورج‌ساز؛ کەسێ کە ماڵی زۆرتر لە ۱۵ نهۆم ساز دەکات. هەروەها: **بُرج‌سازی**

**برجستگی** / barcestegî, barcastegî، ـها/: *اسم.* ۱. زەقی؛ تێ؛ قاچی؛ قیتی؛ میتی؛ قۆقزایی؛ زۆپایی؛ قیتایی؛ گتایی؛ بار و دۆخ و چۆنیەتی زەق بوون ۲. دەرپەڕیوی؛ زۆپی؛ قیتایی؛ ئەوەی لە ڕوویەکدا دەرپەڕیوە یان هاتۆتە دەرەوە ‹پیراهنی که پوشیده بود برجستگی‌های بدنش را به خوبی نمایان می‌ساخت: ئەو کراسە لە بەری کردبوو هەموو زوپی لەشی تەواو دەردەخست› ۳. *[مجازی]* بەرچاوی؛ هەڤیازی؛ هەڵکەوتوویی ‹این فیلم هیچ برجستگی خاصی نداشت: ئەم فیلمە بەرچاویەکی ئەوتۆی نەبوو›.

**برجستن** / barcastan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* //**برجستی**: هەڵبەزیت؛ **برمی‌جهی**: هەڵدەبەزی؛ **برجه**: هەڵبەزە// هەڵبەزین؛ هەڵوەزین؛ هەڵبەزان؛ هەڵتۆقان؛ هەڵتەقان؛ هەڵتۆقین؛ هەڵتەقین؛ هەڵتەکان؛ دەرپەڕین؛ هەڵهاتنەوە؛ ڕاپەڕین؛ بەرپڕەی؛ بەرپڕای؛ هۆرەوەئامەی؛ لە جێ خۆوە دەرپەڕین.

■ صفت مفعولی: **برجسته** (هەڵبەزیو)/ مصدر منفی: **برنجستن** (هەڵنەبەزین)

**برجسته** / barceste, barcaste/: *صفت.* ۱. قوت؛ گت؛ قوب؛ قیت؛ قوبک؛ قوبکە؛ قۆقز؛ قەلپ؛ زوک؛ زوت؛ زۆپ؛ زەپ؛ زەق؛ زیک؛ ڤیت؛ گورمک؛ دەرپەڕیو؛ سەر؛ زۆق؛ دوقلوزمە؛ هەڵبەزیو؛ بلیندتر لە دەور و بەری خۆی ‹نوک برجسته: نووکی قوت› ۲. بەرچاو؛ دیاردە؛ دیار؛ سەر ‹کار برجسته: کاری بەرچاو› ۳. /ـها؛ ـگان/ سەر؛ سەرامە؛ بەرجەستە؛ گرۆبەر؛ چاکتر لەوانی دیکە ‹شخصیت برجسته: کەسایەتی سەرامە›.

**برجیس** / bercîs/: [عربی] *اسم.* سێیارەی

مشتری ☜ **مشتری**[1]-٣

**برچسب** / barčasb، ـهـا/: *اسم.* نیشان؛ بەرچەسپ؛ نووسراوەیەکی چاپی کە نیشاندەری پێناسەی شتێکە.

▣ **برچسب قیمت**: نیشانی بایی؛ بەرچەسپی نرخ؛ نیشانێ کە نرخی شتی لە سەر نووسراوە. هەروەها: **برچسب تاریخ**

▣ **برچسب زدن**: *[مجازی]* مۆرکی شتێک لێدان؛ ناونیتکەنیان؛ ناو نووتکە لێدان؛ بە ناڕەوا قسە بۆ کەسێک هەڵبەستن.
هەروەها: **برچسب خوردن**

**برچه** / barče، ـهـا/: *اسم.* خرزک؛ پاژی مێوینەی گیا.

**برچیدن** / barčîdan/: *مصدر. متعدی.* // **برچیدی**: چنیتەوە؛ **برمی‌چینی**: دەچنیەوە؛ **برچین**: بچنەوە// چنینەوە؛ هەڵچنین؛ کۆکردنەوە؛ ڤەرچیناندن: ١. هەڵگرتنەوە؛ هۆرچنیەی؛ دانە دانە هەڵگرتن لە زەوێ ‹دانه برچیدن: دان چنینەوە› ٢. ماشینەوە؛ گلێرکردنەوە؛ خڕکردنەوە؛ ئەووماشەی؛ پێتەیوە؛ دانەیەک؛ دەی پێوەرە؛ شتێ لە دۆخی پرژ و بلاویەوە نەهێشتنەوە. بەرانبەر: **پهن کردن** ‹سفره را برچیدن: سفرە کۆکردنەوە› ٣. هەڵپێچان؛ کۆکردنەوەی ڕێکخراوەیەک ‹شرکت را برچیدن: بەشدارگە هەڵپێچان› ٤. هەڵپێچاندنەوە؛ نەریت یان قانوونێک هەڵوەشاندنەوە ‹رشوه‌خواری را برچیدن: بەرتیلخۆری هەڵپێچاندنەوە› ٥. هەڵبژاردن؛ هەڵبژارتن؛ ڤاقێرکرن؛ تالبژێرکردن؛ هۆرچنیەی. هەروەها: **برچیدنی**

■ صفت مفعولی: **برچیده** (چنراوە)/ مصدر منفی: **برنَچیدن** (نەچنینەوە)

**برحذر** / barhazar/: [فارسی/ عربی] ☜ برحذر داشتن، **حذر**

**برحسب** / barhasbe, -hasabe/: [فارسی/ عربی] *حرف.* بە پێی؛ بە گوێرەی؛ بە پاو: ١. لەسۆنگەی؛ بە بۆنەی؛ بە هۆ یان بە پێی شتێک ‹برحسب دستور حرکت کرد: بەپێی فەرمان ڕێکەوت› ٢. بە پێوەری ‹وزن برحسب کیلوگرم است: کێشانە بەگوێرەی کیلۆگرەمە›.

**برحق** / barhaq/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ڕاستەقینە؛ ڕاستین؛ بەڕاست؛ ڕاست و ڕەوا ‹پیشوای برحق: پێشەوای ڕاستەقینە›.

▣ **برحق بودن**: بە ڕاست بوون؛ ڕاستەقینە بوون.

**برحق دانستن/ شمردن**: بە ڕاست زانین؛ وە درووس دانان.

**برخاستن** / barxāstan/: *مصدر. لازم.* //**برخاستی**: هەڵسای؛ **برمی‌خیزی**: هەڵدەسی؛ **برخیز**: هەڵسە// ١. هەستان؛ خێزیان؛ هەڵسان؛ هەڵستان؛ هەڵسیان؛ ئەڵسیاین؛ بەرز بوونەوە؛ ڕابوون؛ ڕابین؛ ئاخێزکردن؛ هۆرسەی؛ هۆرێستەی ‹از جای خود برخاستن: لە جێی خۆ هەستان› ٢. وەخەبەر هاتن؛ هەڵسان؛ هەڵسانەوە؛ هەستانەوە؛ هۆرێستەیوە؛ ئەوەهۆرسەی؛ هەیوە بیەی ‹از خواب برخاستن: لە خەو هەستانەوە› ٣. هەڵکردن؛ بەرز بوونەوە؛ هێزگرتن؛ خێزان؛ هۆرسەی؛ خێزیەی؛ هۆرکەردەی؛ ڕەخسان و ڕوودانی ڕەوتێک ‹برخاستن باد: با هەڵکردن› ٤. *[مجازی]* هەستانەوە؛ دەس بە کارێکەوە دان؛ دەس‌پێوەدان ‹به حمایت برخاستن: هەستانەوە بۆ پشتیوانی لێکردن›.
هەروەها: **برخاستنی**

■ صفت فاعلی: **برخیزنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **برخاسته** (هەڵساو)/ مصدر منفی: **برنَخاستن** (هەڵنەسان)

**برخان** / barxān/: [روسی] *اسم.* تەپەیێکی کەوانەیی کە بە هۆی هەڵکردنی با و ڕێکەوتنی ڕیخ و چەووەوە پێک دێ.

**برخلاف** / barxalāf, barxelāf/: [فارسی/ عربی]

☜ **خلاف**[1]

**برخورد** / barxord، ـها/: *اسم.* ۱. وێکەوت؛ ڕووڕا؛ تەتمێ؛ کار یان ڕەوتی ڤێک‌کەتن؛ لێکەوتن؛ لێکدان؛ تەقیان؛ کەوتن، لێدانی دوو شت لە یەکتر ‹دستش با چیز برندەای برخورد کرد: دەستی لە شتێکی تیژ کەوت› ۲. تووش؛ هەڵتەقین؛ کار یان ڕەوتی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ کەسێ یان شتێکدا ‹در برخورد اول او را نشناختم: لە یەکەم وێکەوتندا نەمناسی› ۳. وێکەوتن؛ جووڵانەوە؛ چۆنیەتی هەستان و دانیشتن دەگەڵ شتێ یان کەسێکدا ‹برخورد دولت با مسئلەی بیکاری ناامید کنندە است: وێکەوتنی دەوڵەت لەگەڵ گرفتی بێکاریدا هیوابڕە›. هەروەها: **برخورد داشتن؛ برخورد کردن**

**برخوردار** / barxordār/: *صفت.* کامڕەوا؛ بەهرەمەند؛ بەهرەوەر؛ بەهرەمەن؛ خاوەن بەش یا کەڵک لە شتێکدا ‹او از هوش سرشاری برخوردار است: لە بیرێکی زۆرچاک بەهرەمەندە›. هەروەها: **برخوردار بودن؛ برخوردار شدن**

**برخورداری** / barxordārî، ـها/: *اسم.* بەهرەمەندی؛ بەهرەوەری؛ کامڕەوایی؛ بار و دۆخ و چۆنیەتی بەهرەمەندبوون ‹برخورداری از سلامت: بەهرەمەندی لە لەش‌ساغی›.

**برخوردن**/ barxordan/: *مصدر. لازم.// برخوردی:* تووش هاتی؛ **برمی‌خوری:** تووش دەبی؛ ـ// ۱. هەڵتەقین؛ هەڵتەقان؛ ڤێک‌کەفتن؛ وێک‌کەفتن؛ تووش بوون؛ تووش هاتن؛ گەپچاندن؛ ڕووبەڕوو بوون لە گەڵ کەسێ یان شتێکدا ‹در راه بە گدایی برخورد: لەڕێدا هەڵتەقیە سواڵکەرێکەوە› ۲. پێ گران بوون؛ پێ ناخۆش بوون؛ پێ ناحەز بوون ‹اگر پول بدهی بە او برمی‌خورد: ئەگەر پارەی بدەیتێ پێی گران دەبی› ۳. *[ادبی]* بەهرەدار بوون؛ بەهرەمەند بوون؛ بەهرەوەر بیەی. هەروەها: **برخوردنی**

■ مصدر منفی: **برنَخوردن** (تووش نەهاتن)

**برخورندە** / barxorande/: *صفت.* نەگونجاو؛ نالەبار؛ ناحەز؛ هۆی ڕەنجیان و نارازی بوون ‹رفتار برخورندە: ئاکاری نەگونجاو›.

**برخە** / barxe، ـها/: *اسم. [ریاضی]* کەسر؛ کەرت.

**برخەشمار** / barxešomār، ـها/: *اسم. [ریاضی]* صورت کسر ☜ **صورت‑۴**

**برخەنام** / barxenām، ـها/: *اسم. [ریاضی]* مخرج کسر ☜ **مخرج‑۳**

**برخی**[1] / barxî، ـها/: *صفت. [ادبی]* بڕێ؛ بڕێک؛ بڕێو؛ بازێ؛ هێندێ؛ تاقمێ؛ بەشێ؛ پچەک؛ هەندێ؛ هەندێک؛ هەنێ؛ هندەک؛ پشکەک؛ هەندۆ؛ هنەک؛ چکێ ‹برخی از کتابها پارە بود: بڕێ لە کتێبەکان دڕابوون›.

**برخی**[2]: *ضمیر. [ادبی]* بڕێ؛ بڕێک؛ بڕێو؛ هەندێک؛ هندەک؛ پشکەک؛ پچەک؛ بازێ؛ هێندێ؛ تاقمێ؛ بەشێ؛ هەندێ؛ هەندۆ؛ هنەک؛ چکێ ‹برخی ماندند و برخی رفتند: بڕێ مانەوە و بڕێک ڕۆیشتن›.

**برخیزاندن** / barxîzāndan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **برخیزاندی:** هەڵتساند؛ **برمی‌خیزانی:** هەڵدەستێنی؛ **برخیزان:** هەڵسێنە// هەڵساندن؛ هەڵساندنەوە؛ هەڵسانن؛ هەستاندن؛ ڕاستەوەکردن؛ هۆرێزنای؛ هۆرزنەی؛ ئەوەهۆرزنەی؛ هۆرزنایوە؛ ڕاوەستاندنی شتێ یان کەسێک ‹از جای برخیزاندن: لە جێگە هەستاندن›: **برخیزانیدن**. هەروەها: **برخیزاندنی**

■ صفت فاعلی: **برخیزاننده** (هەڵسێنەر)/ صفت مفعولی: **برخیزانده** (هەڵسێنراو)/ مصدر منفی: **برنَخیزاندن** (هەڵنەساندن)

**برخیزانیدن** / barxîzānîdan/ ☜ **برخیزاندن**

**بُرد**[1] / bord، ـها/: *اسم.* ۱. مەنتش؛ بر؛ بردنەوە لە گرێو ‹قمار برد دارد، باخت هم دارد:

قومار مەتشی هەیە، دانانیشی هەیە› ۲. بر؛ بورد؛ بردنەوە؛ ئەو شتەی بەرندە بەدەستی ئەهێنێ ‹برد تو چقدر بود؟: بری تۆ چەندە بوو؟› ۳. /مجازی/ قازانج؛ بەهرە؛ سوود ‹در آن معامله برد کرد: لەو مامەڵەدا قازانجی کرد› ٤. [عربی]/قدیمی/ بود؛ بورد؛ قوماشی ڕاڕا؛ پارچەی میلەدار.

**ـ برد**[2]: *پیواژە.* ـبرد؛ـبر؛ـبەرد؛ بردن ‹کاربرد: کاربرد›.

**ـ بردار** / bardār/: *پیواژە.* ـهەڵگر؛ ـهۆرگێر؛ ڕاگر: ۱. بەرزکەرەوە ‹باربردار: بارهەڵگر› ۲. بەرگەگر ‹شوخیبردار: شۆخیهەڵگر›.

**ـ برداری** / bardārî/: *پیواژە.* ـبەرداری؛ ـگری؛ ـهەڵگری؛ کار یان ڕەوتی هەڵگرتن ‹عکسبرداری: وێنەگری›.

**برداشت** / bardāšt، ـها/: *اسم.* ۱. هەڵگری؛ کار یان ڕەوتی هەڵگرتن ‹از آن زمین گندم زیادی برداشت شد: لەو زەویە گەنمێکی زۆر هەڵگیرا› ۲. دەسکەوت؛ تێگەیوی ‹برداشت تماشاچیان از فیلم متفاوت بود: دەسکەوتی بینەران لە فیلمەکە جیاواز بوو› ۳. /بانکداری/ کار یان ڕەوتی هەڵگرتن؛ دەرهێنانی پارە لە حیسابی بانکی.

**برداشتن** / bardāštan/: *مصدر. لازم. متعدی.* // **برداشتی:** هەڵتگرت؛ **برمیداری:** هەڵدەگری؛ **بردار:** هەڵگرە// □*لازم.* ۱. تابشت هێنان؛ دەربردن؛ خۆ گرتن؛ بڕ کردن؛ تاقەت هێنان/ هاوردن؛ هەڵگرتن؛ هەڵهاتن؛ هەلاتن ‹چشمش برنمیدارد موفقیت دیگران را ببیند: چاوی هەڵنایەت سەرکەوتنی کەسیتر ببینێت› ۲. هەڵگرتن؛ ئەلگردن؛ خواردن؛ واردەی؛ ئەنەبیەی؛ تێکەوتن؛ لێپەیدا بوون؛ تووشی چۆنیەتی و دۆخێ بوون ‹چروک برداشتن: چرچ هەڵگرتن› □ *متعدی.* ۳. هەڵگرتن؛ هلگرتن؛ ڕاکرن؛ هەلانین؛ قەرۆتن؛ وادارتەنە؛ بەرزەوکردن؛ هلیاندن؛ هلیان؛ هنگرتن؛ وەداردش؛ وەدارتش؛ هۆرگێرتەی؛ هۆرگرتەی؛ هەڵبڕین؛ هۆربڕنەی؛ شتێ لە جێی خۆیدا بەرزکردنەوە ‹رادیو را برداشت و گذاشت روی میز: ڕادیۆکەی هەڵگرت و نایە سەر مێزەکەوە› ٤. هەڵگرتن؛ هۆرگێرتەی؛ هلگرتن؛ بەخاوەن بوون ‹آن را برای خودش برداشت: ئەوەی بۆ خۆی هەڵگرت› ٥. /ادبی/ هەڵبژاردن؛ هەڵگرتن؛ هۆرچنیەی ‹او را به شاهی برداشتند: ئەویان بە شایی هەڵبژارد› ٦. گرتن؛ گێرتەی؛ تۆمارکردن ‹عکس برداشتن: وێنە گرتن› ۷. هەڵگرتن؛ دزین؛ ڕفاندن؛ ئڕفانەی؛ بردن؛ بەردەی؛ ڕاپسکاندن؛ ڕاڕفاندن ‹بسته را گذاشته بود روی میز، یکی برداشت و رفت: بەستەکەی لە سەر مێزەکە دانابوو، یەکێ هەڵیگرت و ڕۆیشت› ۸. هەڵگرتن؛ داگرتن؛ لابردن؛ لابەردەی؛ شتێک (وەکوو چاویلکە، لەچک، کڵاو یان چارشێو) لە جێی خۆی لابردن ۹. داگرتن؛ دانەبەر؛ گێرتەیرە؛ ئەرەگێرتەی ‹آب همەجا را برداشت: ئاو هەموو لای داگرت›. هەروەها: **برداشتنی**

■ صفت فاعلی: **بردارندە** (هەڵگر)/ صفت مفعولی: **برداشتە** (هەڵگیراو)/ مصدر منفی: **برنَداشتن** (هەڵنەگرتن)

**بردبار** / bordbār، ـها؛ ـان/: *صفت.* پرزوو؛ بە برست؛ بێنفرەهـ ؛ بە تابشت؛ بە تاقەت؛ بەحەوسەلە ‹در برابر این سختیها باید بردبار باشی: لە بەرامبەر ئەم دژوارییانەدا دەبێ بەتاقەت بی›.

**بردباری** / bordbārî، ـها/: *اسم.* پرزوویی؛ تەوتین؛ تەوات؛ پشووردرێژی؛ بێنفرەهی؛ پرزەداری؛ توانایی خۆڕاگری لە بەرانبەر سەختی و نالەباریەوە.

**بردگی** / bardegî، ـها/: *اسم.* کۆیلەیی؛

کۆلەتی؛ کۆیلەتی؛ عەبدایەتی؛ بەندەیی؛ لێزیەتی؛ بار و دۆخی چۆنیەتی بەندە بوون.

**بردمیدن** / bardamîdan/: مصدر. لازم. متعدی. [ادبی] // **بردمیدی:** هەلتدا؛ **برمی‌دمی:** هەلدەدەی؛ **بردم:** هەلدە// هەلدان: ◻لازم. ١. هەلاتن؛ هەلهاتن؛ هۆرکەوتەی؛ هۆرکێشیەی ‹خورشید بردمید: هەتاو هەلیدا› ٢. ڕوان؛ شین بوون؛ ڕسەی؛ دەمنەی؛ سەر هەلدان ‹سبزه بردمید: شینکایی هەلیدا› ◻ متعدی. ٣. با تێکردن؛ دەماندن؛ دەمنای.

هەروەها: بردمیدنی

■ صفت مفعولی: **بردمیده** (هەلدراو)/ مصدر منفی: **برنَدمیدن** (هەلنەدان)

**بردن** / bordan/: مصدر. متعدی. لازم. //**بردی:** بردت؛ **می‌بری:** دەبەی؛ **ببر:** ببە// بردن؛ برن؛ بەردەی: ◻ متعدی. ١. شتێ لە لای بیسەر و بێژەر دوور خستنەوە ‹کتاب را بیرون بردن: کتێب بردنە دەرەوە› ٢. ڤەگوهاستن؛ ڕاگواستن؛ ئەووەوارەی؛ کەسێ یان شتێک گەیاندنە جێگایەک ‹کسی را به جایی بردن: کەسێک بۆ شوێنێک بردن› ٣. دزینی شتێک لە جێگایەک ‹مال کسی را بردن: مالی کەسێک بردن› ٤. ئازار/ ئێش گەیاندن ‹سر کسی را بردن: سەری کەسێ هاوردنە ئێش› ٥. سەرکەوتوو یان بەرندە بوون ‹جنگ را بردن: شەڕ بردنەوە› ٦. سڕین؛ سڕینەوە؛ سەڕتەی؛ لابردن؛ پاکەوکردن؛ شتێک پاککردنەوە ‹رنگ را بردن: ڕەنگ سڕینەوە› ◻لازم. ٧. کێشان؛ تابشت هێنان ‹رنج بردن: ڕەنج بردن› ٨. تێچوون؛ خایاندن ‹سه سال کار برده است: سە سال کاری تێچووە› ٩. قازانج بەدەس هێنان ‹سود بردن: بەهرە بردن›.

هەروەها: بردنی

■ صفت فاعلی: **برنده** (ـ)/ صفت‌مفعولی: **برده** (براو)/ مصدر منفی: **نَبردن** (نەبردن)

**بردوباخت** / bord-o-bāxt، ـها/: اسم. ١. کار یان ڕەوتی بردنەوە و دانان ‹تمام شب مشغول بردوباخت بود: تەواوی شەو خەریکی بردنەوە و دانان بوو› ٢. کار و ڕەوتی بردن و دۆڕاندن؛ ئەوەی کە ئەبرێتەوە یان دائەنرێ ‹بیش از یک میلیون بردوباخت داشت: زۆرتر لە ملیۆنێک بردن و دۆڕاندنی بوو›.

**بردوختن** / bardûxtan/: مصدر. متعدی. [ادبی] // **بردوختی:** هەلتدووراند؛ **برمی‌دوزی:** هەلدەدووری؛ **بردوز:** هەلدوورە// هەلدووران؛ هەلدوورین؛ دووراندن؛ دوورین؛ دروون؛ هەلدروون؛ هۆرۆراسەی ‹پیراهن بردوختن: کراس هەلدووران›. هەروەها: **بردوختنی**

■ صفت مفعولی: **بردوخته** (هەلدووراو)/ مصدر منفی: **برنَدوختن** (هەلنەدووراندن)

⊡ **چشم بردوختن:** چاو برین؛ زەق- زەق نواڕین؛ چاو لە شتێ هەلنەگرتن.

**برده** / barde، ـها؛ ـگان/: اسم. بەندە؛ کۆیلە؛ کۆلە؛ بەنە؛ بەنی؛ قول؛ لێز؛ بەردە؛ عەبد؛ خولامی زێرکڕی.

⊡ **برده بودن:** بەندە بوون؛ کۆیلە بوون؛ لەژێر دەستی کەسێکی دیکەدا بوون. هەروەها: **برده شدن**

**برده ساختن:** کۆیلەکردن؛ یەخسیر کردن؛ کەسێ دیلکردن و وەک کۆیلە کار لێ کێشانەوە.

**بردەدار** / bardedār/: صفت. کۆلی‌دار؛ کۆیلەدار؛ خاوەن بەنی.

**بردەداری** / bardedārî/: اسم. کۆیلەداری؛ بەندەداری: ١. کار یان ڕەوتی کڕین و فرۆشتن و بەهرە هەلکڕاندن لە کاری بەنی ٢. سیستەمێکی ئابووری و کۆمەلایەتی کە تاقمێک دەبوونە بەندەدار و کاری کڕین و فرۆشتنی کۆیلەیان دەکرد و تاقمێکیش دەکرانە کۆیلە.

**برده‌فروشی** / bardefurûšî/: اسم. به‌رده‌فرۆشی؛ کۆیله‌فرۆشی.

**بردی** / bardî/: [عربی] ☜ **پاپیروس**

**بررس** / bar.res، ـها/: اسم. چاودێر؛ که‌سێ که‌ کاری چاوه‌دێری‌کردن له‌ بابه‌تی فه‌رهه‌نگی (وه‌کوو میدیا، کتێب، فیلم و ...) بۆ به‌رگری‌کردن له‌ بلاوبوونه‌وه‌ی مه‌به‌ستی دژ به‌ قانوون یان به‌رژه‌وه‌ندی ده‌سه‌لات.

**بررسی** / bar.resî، ـها/: اسم. لێروانی؛ ڕه‌وتی به‌ دوادا چوون؛ لێکۆڵینه‌وه؛ تۆژینه‌وه و تاوتوێ‌کردن له‌ شوێنێک، شتێک یان بابه‌تێک به‌ ئاریکاری بیر و هزر و ئازمایشت و هه‌روه‌ها خۆندنه‌وه و پرس‌وڕا له‌ ئاگادارن ‹بررسی روزنامه‌ها: توێژینه‌وه‌ی ڕۆژنامه‌گه‌ل›.
هه‌روه‌ها: **بررسی شدن؛ بررسی کردن**

**برزخ**[1] / barzax/: [معرب از فارسی] اسم. به‌رزه‌ک: ١. وه‌رهه‌نگ؛ دۆژی دوڕ؛ مه‌ودای نێوان دوو شت ٢. جیگه‌یه‌ک نێوان به‌هه‌شت و دۆزه‌خ ٣. [جغرافیا] باریکه‌؛ ته‌نگه‌زه‌وی؛ وشکانییێکی باریکی به‌ین دوو ئاو.

**برزخ**[2]: صفت. [گفتاری] دڵگران؛ دۆزه‌خ؛ قه‌ڵس؛ دڵمه‌ن؛ دۆزه‌خ ‹چرا برزخ شدی؟ من که‌ چیزی نگفتم: بۆچی دلگران بووی؟ خۆمن شتێکی‌وام نه‌گوت›.

**برزگر** / barz(e)gar، ـها؛ ـان/: اسم. وه‌رزیار؛ وه‌رزێر؛ وه‌رزه‌وان؛ جووتێر؛ جووتیار؛ هیتیار؛ جووت‌به‌نده؛ هیته‌وان؛ به‌زگه‌ر؛ وه‌رزیه‌ر؛ وه‌رزگه‌ر؛ کشاوه‌رز؛ که‌سێ که‌ له‌ لادێدا کاری کشت‌وکاڵ به‌تایبه‌ت ده‌غڵ و دان ده‌کا. هه‌روه‌ها: **برزگری**

**برزن** / barzan، ـها/: اسم. گه‌ڕه‌ک؛ تاخ و کۆڵان؛ به‌شێ له‌ بازێر بریتی له‌ چه‌ن شه‌قام و کۆڵان.

**برزنت** / berezent/: [روسی از هلندی] اسم. برێزنت؛ جۆرێ پارچه‌ی ئه‌ستووره بۆ دروست‌کردنی چادر و ڕووکێش و...

**برزنتی** / berezentî/: [روسی از هلندی] صفت. برێزنتی؛ له‌ چه‌شنی برێزنت ‹چادر برزنتی: چادری برێزنتی›.

**برزنگی** / barzangî، ـها/: صفت. ١. [قدیمی] به‌رزه‌نگی؛ خه‌ڵکی زه‌نگبار ٢. زه‌نگی؛ ڕه‌ش‌پێست.

**برزوبالا** / borz-o-bālā/: اسم. [ادبی] به‌ژن و بالا؛ ته‌رزی؛ له‌باری.

**برس** / bars، ـها/: اسم. به‌رس؛ ئه‌و چێوه له‌ لووتی وشتری ده‌که‌ن: **ورس**

**برس** / boros, b(e)ros، ـها/: [فرانسوی] اسم. برووس؛ برووش؛ برۆس: ١. ئامرازێ بۆ شانه‌کردنی سه‌ر ٢. ئامێرێک بۆ پاک کردنه‌وه‌ی شتێ (وه‌کوو فلچه و میسواک).

**برسام** / barsām/: اسم. [پزشکی] ئاوبه‌نگ؛ به‌ره‌زام؛ ئاڤسینگ؛ نه‌خۆشیه‌که له‌ ئاوسانی په‌رده‌ی سی و په‌یدا بوونی شلاوێک تێیدا.

**برساوس** / barsāvos/: [معرب از یونانی] ☜ **بَرساوُش**

**برساوش** / barsāvoš/: [معرب از یونانی] اسم. [نجوم] به‌رساوش؛ وێنه‌یه‌کی ئاسمانی له‌ بیچمی پیاوێک که‌ سه‌رێکی بڕاوی به‌ ده‌سته‌وه‌یه: **برساوس؛ برشاوس؛ حامل رأس‌الغول**

**برسکیزیدن** / barsekîzîdan/: مصدر. لازم. [قدیمی] هه‌ڵتووزان؛ هه‌ڵتۆزان؛ هه‌ڵجووزان؛ هه‌ڵتیزان؛ لووشک وه‌شاندن؛ جۆتلێ شانه‌ی؛ له‌قه‌ هاویشتن و قوشقی بوون.

**برسم** / barsam، ـها/: اسم. به‌رسه‌م؛ ده‌سته‌یه‌ک له‌ چڵه‌دار، یان ئاوه‌ها شتێکی له‌ کانزا که‌ پیره زه‌رده‌شتیه‌کان کاتی به‌جێ‌هێنانی ڕێ و ڕه‌سمی ئایینیان

بەدەستیانەوە دەگرن.

**بـرش** / boreš، ـها/:/اسم. بڕشت؛ لـەت؛ لـت؛ قـەڵـت: ١. قـەڵـشێ کـە بـە هـۆی ئـامێرێکی تیـژەوە بـەدیهـاتووە ‹بـرش عرضـی: برشتـی بەپاناوە› ٢. قاش؛ قاژ؛ کـووز؛ بـەشـێ لـە شـتێ کـە بـڕاوە ٣. بـڕیامان؛ شـێوازی بڕینـەوەی پارچـە ‹بـرش لبـاس: بریامانـی بـەرگ› ٤. کـار یان ڕەوتی بڕین ‹برش کردن: لەتکردن›.

◘ **بـرش دادن:** بـڕین؛ بـڕیامانکـردن؛ بـڕینی شـتێک بـە پێـی نـەخـشە یـان ویـستێکی لـە پێشەوە بڕیار دراو.

**بـــرش** / borš/:/اســم. چێــشتاوی کــەلــەم؛ چێــشتاوێک کــە گۆشــت، کــەلــەرم و جــار و بارەش گێزەرە و چۆنەری تێ دەکەن.

**برشـــاوس** / baršāvos/: [معـرب از یونـانی] ☜ **بَرساوُش**

**برشتار** / bereštār، ـها/:/اسم. برژێنـە؛ برژێنـەر؛ نانبرژێن؛ کەرەستەیەکی (زۆرتر) کارەبـایی کـە نانی پێ گەرم دەکەنەوە یان دەیبرژێنن.

**برشـــتوک** / bereštûk/:/اسم. برسـاق؛ جـۆرێ شیرینی لە ئارد و شەکـر و حـل کـە لـە ڕۆنـدا سوور دەکرێتەوە.

**برشـته** / berešte، ـها/: صفت. بـرژاو؛ براشـتی؛ بریان؛ برشتە؛ نورشتە؛ برژیـو؛ برژیـاو؛ برژیـاگ؛ بریژیـا؛ بـرژراو؛ بـورش؛ وشـک و تورتـەوە بـوو بـەهۆی ئـاور یـان تـینی زۆرەوە (بـەتایبـەت بـۆ خواردەمەنی).

**برشـتەکـن** / bereštekon، ـها/:/اسم. برژێنـەر؛ برێژنە؛ نانبرژێن.

**برشـکار** / boreškār، ـها؛ ـان/:/اسم. برشـتکار؛ ئـەو کـەسـەی کـە کـاری بـڕینی تیکـەگـەلی (وەک پارچـــە؛ مـــشەمـــا؛ ئاســن و...) لـــە ئەنـدازەگـەلی ڕێـکوپێکـە، بـۆ دوورانـدن یـان پێک هێنانی بەرهـەمـی پێویـست. هـەروەهـا: **برشکاری**

**برشـــمردن**/ baršomordan, baršemordan/: مـصدر. متعـدی. [ادبـی] // **برشُـمردی:** هـەڵـتدا؛ **برمیشُماری:** هـەڵـدەدەی؛ **برشُمُر:** هـەڵـدە// ١. هەڵدان؛ هەڵژماردن؛ هەڵشماردن؛ بـاسکـردن؛ ناو لێ بردن ‹گناهان او یک به یک برشـمرد: ئـەوی گونایکردبـوو هـەمووی هـەڵـدا› ٢. هـەژمـارتن؛ ژماردن؛ شماردن؛ مۆردەنە؛ هەژماردن؛ ئژمارەی؛ حەساوکردن. هەروەها: **برشمردنی**

■ صـفت فـاعلی: **برشـــمارنده** (هـەڵـدەر)/ صـفت مفعـولی: **برشـــمرده** (هـەڵـدراو)/ مـصدر منفـی: **برنَشمردن** (هەڵنەدان)

**برص** / baras/: [عربی] ☜ **پیسی ـ١**

**برطـــرف** / bartaraf/: [فارسـی/ عربـی] صـفت. نـەمـاو؛ لاچـوو؛ لـە نـاو چـووگ؛ ونـداچوو ‹آن سـرمای شـدید برطـرف شـده اسـت: ئـەو تـۆفی سەرمایە نەماوە›.

**بـــرعکس**[1] / bar'aks/: [فارسـی/ عربـی] صـفت. پێچـەوانـە؛ چۆپـەوانـە؛ چـەپ؛ بـەراوەژوو؛ بـەراوەژۆ؛ بـەراوەژی؛ سـەرەوقـوون؛ چـەواشـە؛ چوارشی؛ تەرسـە؛ بـە چۆنیـەتی یـان چییـەتی دژبـەریـەوە ‹حرفهـایش بـرعکس عملـش بـود: قسەکانی پێچەوانەی ئاکاری بوو›.

**بـــرعکس**[2]: قیـد. پێچـــەوانـــە؛ چۆپـــەوانـــە؛ بـــەراوەژوو؛ ســـەرەوقـــوون؛ چـــەواشـــە؛ دژ؛ تـەرسـە؛ بـەراوەژی: ١. بـە وێنـەی دژبـەری یان بە پێچـەوانـەوە ‹برعکس عمـل مـیکـرد: بـە پێچـەوانـە کـاری دەکـرد› ٢. سـەرەونخـوون؛ سـەرەووار؛ سـەرەوخـوار؛ سـەر و قنـگ ‹عکس شاە برعکس چاپ شـدە بـود: وێنـەی شـا پێچـەوانـە چاپ کرابوو›.

**بـــرغ** / barq، ـها/:/اسم. بـەرەگـە؛ وەرەگـە؛ شـەلـەگـە؛ بـەنگـا؛ بـەنگـە؛ کـەرت؛ جـێ گـەڕاندنـەوەی ئـاو؛ جێگـەیـەک لـە چـەم و جۆگەلە کە بـە هـەڵـبەسـتنی، ئـاو دەکـەوێتـە جێیەکی دیکەوە. هەروەها: **برغاب**

**برغاب** / barqāb/ ☜ **برغ**

**برغو** / borqû. ـها/: [ترکی] /اسم. [قدیمی]/ زرنا؛ کەلەشاخ؛ سەرناوی؛ سازێکی وایی و شاخئاسایی کە ناوخاڵیە و بە دەنگی گڕدار لە جەژنگەلی گەورە و شەڕدا پێی دەچرن.

**برف** / barf/: /اسم. بەفر؛ ڤەور؛ وەرب؛ بەرف؛ بەور؛ وەروە؛ ڤەر؛ ڤەرڤە؛ ویەر؛ وەفر: ١. کولۆی سپیلانەی ڕسکاو لە بۆقی ڕچاو، کە لە هەوای ساردا لە ئاسمانەوە دادەباری ‹برف می‌بارد: بەفر ئەباری› ٢. کۆمای ئەو کولۆگەلە کە لە شوێنێکدا کۆ بوونەتەوە ‹برف پشت‌بام را انداختم: بەفری بانم ڕامالی›.

◙ **برف پیری**: /مجازی/ بەفری پیری؛ چەرمگی موو؛ سپیەتی موو بە هۆی پیریەوە ‹برف پیری بر سرش نشسته بود: بەفری پیری لە سەری ڕۆنیشتبوو›.

◙ **برف آمدن**: بەفر بارین؛ بەور بارین؛ وەرو وارەی؛ بارینی بەفر ‹دیروز برف آمد: دوێنێ بەفر باری›.

**برف انداختن**: بەفر مالین؛ ڤەور پارۆ کردن.

**برف گرفتن**: بەفر دادان؛ بەفر داکردن؛ وەروگێرتەینە؛ بەفر دەست پێکردن ‹توی راه برف گرفت: لە ڕێگادا بەفر دایکرد›.

**برف نشستن**: بەفر نیشتن؛ بەفر داپۆشین؛ بەفر داگرتن؛ وەرو هەسەمیایرە؛ وەرو تەپیایرە؛ سپی بوونەوەی زەوی و دار و بەرد بە هۆی بارینی بەفرەوە.

**برفاب** / barfāb/: /اسم. بەفراو؛ وەرواوە؛ ئاوی بەفر: ١. بەرفەو؛ ئاوێ کە لە توانەوەی بەفر پێک‌دێت ٢. ئاوێک کە بۆ سارد بوونەوە، بەفری تێکراوە.

**برف‌بازی** / barfbāzî. ـها/: /اسم. کۆپەلان؛ گونەلانی؛ هوپەلان؛ تۆپەلەبازی؛ تۆپەلەشەڕێ؛ گولۆلەبازی؛ گولۆلەشەڕێ؛ شەرە بەفەر؛ گودا ڤەوری کەری؛ گەمەی تۆپەلە بەفر بە یەکا دان.

**برف‌پاک‌کن** / barfpāk.kon. ـها/: /اسم. بەفرپاک‌کەر؛ بەفرسڕ؛ بەورمال؛ کەرەسەیەک بە ڕووی شووشەی پێش، دوا یان چرای گەڕۆکەوە بۆ سڕینەوەی بەفر و باران.

**برفچال** / barfčāl. ـها/: /اسم. بەفرەچال؛ چالەبەفر؛ پیرەچال؛ وەروەچالە؛ چالی قەلاپەچن بوو لە بەفر.

**برفرو** / barfrow. ـها/: /اسم. بەفرەڕۆ؛ گەڕۆکێکی تایبەت بۆ چوون بە سەر بەفردا: **اسنومُبیل**

**برف‌روب** / barfrûb. ـها/: /اسم. بەفرەلۆ؛ بەفرمال؛ وەروەرۆ؛ وەروەمال؛ بەفرمالک؛ شەپالوخ؛ کەسێک، کەرەسەیەک یان ماشینێک کە کاری مالینی بەفرە.

**برف روبی** / barfrûbî/: /اسم. بەفرمالی؛ کار یان ڕەوتی بەفر مالین؛ بەفر ڕادان؛ وەروەمالەی.

**برفک** / barfak/: /اسم. بەفرەک: ١. /پزشکی/ وەزێ؛ دانەدانەی سپی کە زیاتر بە زاری منداڵانەوە دەنیشێ ٢. کورش؛ کورشە؛ بەستەڵەک؛ هەڵمی ڕچاو وەک دانەی بەفر لە سەر شیشە و... ‹شیشەها برفک بستە است: شیشەکان بەستەڵەکیان بەستووە› ٣. خاڵ‌خاڵی سپی لە سەر شاشەی تەلەویزیۆن و ڕادار.

**برف‌گیجه** / barfgîce/: /اسم. ١. کڕێوە؛ کرێڤە؛ کڕیوە و بۆران؛ با و بۆران؛ کڕیوەپێچ؛ توف؛ بادەوە؛ باپێچ؛ بازریشک؛ باسریشک؛ باهۆ؛ باهووە؛ بەفر و با پێکەوە ٢. سەرلێشێواوی بەهۆی بارینی زۆری بەفرەوە یان داپۆشرانی دەور و بەر بە بەفر، لەگەل توف و بادا کە بنیادەم ناتوانێ ڕێگا

بدۆزیتەوە.

**برفگیر** / barfgîr/: *صفت.* بەفرگر؛ وەروەگا؛ ئەو شوێنەی کە بەفر وەخۆ دەگرێ.

**برفمرز** / barfmarz، ـها/: *اسم.* ئەو کێڵەی لە داوێنی چیادا کە بە گرێمانە داندراوە و سەرەوەی لە بەفر داپۆشراوە و هاوینیش ناتوێتەوە.

**برفوشیره** / barf-o-šîre/: *اسم.* بەفر و دۆشاو؛ جۆرێ خواردەمەنی لە تێکەڵی بەفر و دۆشاوی ترێ یان توو.

**برفی**[1] / barfî/: *اسم. [گفتاری]* بەفرماڵ؛ بەفرەماڵ؛ وەروە ماڵ؛ بان ماڵ؛ کەسێ کە کاری بەفر ڕاماڵینە.

**برفی**[2]: *صفت.* بەفرین: ١. بەفرالوو؛ بە بەفر ‹هوای برفی: هەوای بەفرین› ٢. بەفرینە؛ بەفری؛ لە بەفر چێکراو ‹آدم برفی: بووکە بەفرینە› ٣. بە ڕەنگی سپی بریقەدار.

**برق** / barq/: [عربی]/*اسم.* ١. برووسکە؛ ورێ؛ ورۆ؛ بریقە؛ بریسکە؛ هەورەبرووسکە؛ هەورەترێشقە؛ تریشقە؛ هوروسکە؛ بەلاچە ‹رعد و برق شروع شد: گرمە و برووسکە دەستی پێکرد› ٢. کارەبا؛ بەرق ٣. بریقە؛ ورچە؛ وەرشە؛ ورشە ‹از خوشحالی چشمانش برق میزد: لە خۆشیانا چاوی بریقەی ئەدایەوە›.

⊡ **برق افتادن**: بریقە لێکەوتن؛ درەوشانەوە؛ درەوشیانەوە ‹کاشیها برق افتاده بود: کاشیەکان بریقەیان لیکەوتبوو›.

**برق انداختن**: بریقەخستن؛ بریکە لێخستن؛ درەوشاندنەوە ‹همە جا را برق انداخت: بریقەی خستبووە هەموو شوێنێک›.

**برق جستن**: بریقە دانەوە؛ برووسکانەوە؛ تروسکانەوە؛ تریسکانەوە؛ تەیسین؛ درەوشانەوە ‹از چشمهایش برق جست: چاوی درەوشایەوە›.

**برق داشتن**: برووسکەدار بوون؛ کارەبا هەبوون؛ هەبوونی گەڕیانی کارەبا لە شوێنێ یان لە شتێکدا.

**برق رفتن**: برق چوون/ چوونەوە؛ برق لوایوە؛ ڕۆیشتنەوەی کارەبا و بڕیانی ‹در خانه نشسته بودیم که یک دفعه برق رفت: لە ماڵەوە دانیشتبووین کوتوپڕ برق چوو›.

بەرانبەر: **برق آمدن**

**برق زدن**: تەیسین: ١. بریقەدانەوە؛ تیشکدانەوە؛ درەوشانەوە؛ تروسکانەوە؛ چووسکەدان ‹روی زمین چیزی برق میزد: لە سەر زەویدا شتێک دەتەیسا› ٢. چەخماخە لێدان؛ ورۆکەوتەی؛ پێ هاتنی هەورەتریشقە لە ئاسماندا ‹آسمان برق زد و غرش رعد شنیده شد: ئاسمان تەیسایەوە و گرمەی هات›.

**برق گرفتن**: برق گرتن؛ کارەبا گرتن: ١. گەڕیانی بەرق بە لەشدا ‹آزاد را دیروز برق گرفت: دوێنێ، ئازاد بەرق گرتی› ٢. کارەبا لێگرتن؛ وەرگرتنی کارەبا لە کەرستە یان شوێنێک ‹باید از این سیم برق بگیری: دەبێ لەم سیمە کارەبا بگری›.

**برقابی** / barqābî/: [عربی/ فارسی] *صفت.* پێوەندیدار بە وەرگرتنی بەرق لە ئاو.

**برق آسا** / barqāsā/: [عربی/ فارسی] *صفت. [کنایی]* بەرقئاسا؛ برووسکەئاسا؛ وەک تریشقە؛ لە زەبر؛ تیژ؛ گورج؛ کرژ؛ گورد؛ تاشک.

**برقبند** / barqband، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بەرقڕاگر؛ بە تایبەتمەندی یان هێزی برق لە خۆوە نەبواردن.

**برقدرمانی** / barqdarmānî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* بەرقدەرمانی؛ چارەسەرکردنی نەخۆشین لە سۆنگەی کەرەسەگەلی کارەباییەوە.

**برقرار** / barqarār/: [فارسی/ عربی] *صفت.*

دامەزراو؛ مەرزیا؛ ١. دابین؛ بەرقەرار؛ دیاریکراو؛ دەستنیشانکراو ‹صلح برقرار شد: ئاشتی دابینکرا› ٢. *[گفتاری]* بەردەوام؛ راوەستۆخ ‹سر کار تازەات برقرار شدەای؟: لە سەر کاری تازەتەوە دامەزراوی؟›. هەروەها: **برقرار بودن؛ برقرار شدن؛ برقرار کردن؛ برقرار گردیدن؛ برقرار گشتن؛ برقرار ماندن**

**برقراری** / barqarārî/: [فارسی/ عربی]/اسم. جێگرتوویی؛ بەردەوامی؛ دامەزراوی؛ بەرقەراری ‹برقراری امنیت: جیگرتوویی هێمنایەتی›.

**برقراهه** / barqrāhe، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. خولگە؛ شوێنی گەڕانی شتێک بە دەوری شتێکیتردا.

**برقرسانی** / barqresānî/: [عربی/ فارسی] /اسم. بەرقکێشی؛ کارەباکێشی؛ کار و رەوتی گەیاندن و دانی کارەبا بە شوێنێک ‹برقرسانی بە چند روستای دورافتادە آغاز شد: کارەباکێشی بۆ چەند گوندی تەرە دەسپێکرا›.

**برقزدگی** / barqzadegî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. برقلێداوی؛ کار یان رەوتی تریشقە لێدان؛ تریشقەکەوتەی ‹چند درخت بر اثر برقزدگی سوختند و ذغال شدند: چەند دار بەهۆی بەرق لێداوییەوە سووتان و بوونە سوخاڵ›.

**برقسنج** / barqsanc، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. کارەباپێو؛ هەرکام لە کەرەسەگەلی ئەندازەگرتنی کارەبا.

**برقشناخت** / barqšenāxt/: [عربی/ فارسی] /اسم. بەرقناسی؛ زانستی کارەباناسی؛ برووسکەناسی؛ زانستی ناسینی دیاردەگەلی کارەبایی و شێوەی کەڵک لێوەرگرتنیان.

**برقع** / borqa'، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* پەچە؛ چارەپۆش؛ رووبەن؛ رووبەند؛ رووبەنە؛ پارچەیەک کە سەر و رووومەتی ژنان دادەپۆشێ.

**برقکار** / barqkār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. بەرقکار؛ کارەباچی؛ کەسێ کە کاری دروست کردن و دروست کردنەوەی کەرەسەگەلی کارەبایی یان راگرتن و راهێنانی دامەزراوەی کارەبا بێت.

**برقگر** / barqgar، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. بەرقچی؛ کەسێک کە سەر و کاری لەگەڵ کارەبایە.

**برق گرفتگی** / barqgereftegî/: [عربی/ فارسی] /اسم. بەرق‌گرتوویی؛ کار یان رەوتی بەرق‌گرتن؛ تێپەڕینی بەرق لە لەشی گیاندارەوە.

**برقگیر** / barqgîr، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. تریشقەگیر؛ برووسکەگیر؛ هەورگر؛ ورەگێر؛ هەوره‌برووسکەگر؛ میلەیەکی کانزایی کە بە سەر خانووە بەرزەکاندا هەڵی دەدەن تا باری کارەبایی هەورە تریشقە بۆ زەوین رابگوێزێ و نەهێڵێت خانووەکە تریشقە لێیبدا.

**برقماهی** / barqmāhî، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. هەرکام لە ماسیگەلی جۆربەجۆر کە بە فەلس و پووڵەکەی لەشیان بەرق دروست دەکەن: **ماهی برقی**

**برقنما** / barqnemā، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. برووسکەنوێن؛ کەرەسەیێک بۆ دیاری کردنی هەبوون یان چۆنیەتی بەرقی وەستاو لە شوێنێک یان ئامرازێکدا: **الکتروسکوپ**

**برقو** / borqû، ـها/: [ترکی؟]/اسم. بورغوو؛ ئامرازی تایبەت بۆ ساف و لووس‌کردن یان گەورەکردنەوەی ناو لوولە: **برغو**

**برقی**[1] / barqî، ـها/: [عربی]/اسم. *[گفتاری]* بەرقی؛ بەرقچی؛ برقکار؛ سیمکێش یان کەسێ کە کاری دروست‌کردنەوەی ئامرازی

کارەباییە.

**برقی**[٢]: *صفت.* ١. کارەبایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کارەباوە ٢. کارەبایی؛ ئەوەی کە بە کارەبا کار بکا ٣. *[گفتاری]* بریقەدار ‹کفش برقی: کەوشی بریقەدار›.

**برقی**[٣]: *قید. [گفتاری]* بەرقی؛ ئازا؛ وەک بەرق؛ کرژوکۆڵ؛ زۆر گورج و گۆلانە ‹برقی برو و برگرد: بەرقی بچۆ و وەرەوە›.

**برک / barak/**: *اسم. [قدیمی]* بەرگن؛ بەرگنە؛ جۆرێ پارچەی ئەستووری دەسچن لە خوری یان مەرەز کە زۆر گەرمە و بۆ بەرگی زستانی بە کار دێ.

**برکات / barakāt/**: [عربی] جمعِ ☜ **بَرَکَت**

**برکت / barekat, bar(a)kat/**: ـها؛ بَرَکات/: [عربی]/*اسم.* فست؛ پیت؛ بەرەکەت؛ خێر و بەرەکەت: ١. کارایی و چییەتی ‹این سرسبزی از برکت آب است: ئەم شینابییە لە پیتی ئاوەوەیە› ٢. فراوانی؛ زۆری؛ ڕمێن ‹خدا برکت به کسبت بدهد: خوا پیت بخاتە نێو کارت›.

**برکشیدن / barkešîdan/**: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **برکشیدی:** هەڵتکێشا؛ **برمی‌کشی:** هەڵدەکێشی؛ **برکش:** هەڵکێشە// ١. هەڵکێشان؛ هەڵکێشاندن؛ هەڵاکشاندن؛ هەڵکشاتن؛ هەڵکشان؛ هۆرکێشتەی؛ هۆرکێشای؛ بۆ سەرەوەکێشان ٢. کێشانە بان؛ گەشە پێدان؛ بردنەی سەر؛ بوونە هۆی بەرز بوونەوەی کەسێک ٣. هەڵشکان؛ دەرکێشان؛ بەرکێشتەی؛ هێنانە دەر؛ دەرهاوردن. هەروەها: **برکشیدنی**

■ صفت مفعولی: **برکشیده** (هەڵکێشراو)/ مصدر منفی: **برنَکشیدن** (هەڵنەکێشان)

**برکلیم / berkelyom/**: [انگلیسی]/*اسم.* بیرکیلیۆم؛ توخمێکی کیمیاوی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ و خۆنەگر، لە دەستەی ئاکتینیدەکانە بە ژمارەی ئەتومی ٩٧ەوە.

**برکنار / barkenār/**: *صفت.* لا: ١. دوور؛ لاتەریک؛ کەنار؛ تەرە؛ وەر؛ جیا و بێ پەیوەندی بە شتێکەوە ‹او همیشه از این کارها برکنار بود: لەم کارانە هەر دوور بوو› ٢. لابراو؛ لادراو؛ لاخراو؛ دەرکراو لە کار و پۆستێک ‹او را از کارش برکنار کردند: لە سەر کارەکەی لایان برد›. هەروەها: **برکناری؛ برکنار بودن؛ برکنار شدن؛ برکنار کردن**

**برکندن / barkandan/**: *مصدر. متعدی. [ادبی]*// **برکندی:** هەڵتکەند؛ **برمی‌کنی:** هەڵدەکەنی؛ **برکن:** هەڵکەنە// هەڵکەندن؛ هەڵبچیرێن؛ هەڤپچرین؛ ڤەچرین؛ هەڵکولۆشان؛ هەڵکلۆشانن؛ هەڵکلۆشاندن: ١. کەندن؛ دەرهێنان؛ لە شوێن خۆوە هەڵکێشان؛ هەڵقەندن؛ هۆرکەنتەی ‹ریشەی درخت را برکندن: ریشەی دار هەڵکەندن› ٢. لە نێو بردن؛ هۆرکەنتەی ‹ریشەی دشمنی برکن: ریشەی دوژمنایەتی هەڵکەنە› ٣. هەڵپچڕاندن؛ پەڕاندن؛ جیاکردنەوە؛ پڕنەی؛ گۆڕین ‹سر سرکشان را ز تن برکند: سەری سەربزێوان هەموو هەڵکەن›. هەروەها: **برکندنی**

■ صفت مفعولی: **برکنده** (هەڵکەنراو)/ مصدر منفی: **برنَکندن** (هەڵنەکەندن)

**برکه / berke/**: ـها/: [عربی]/*اسم.* گۆم؛ گۆل؛ گۆلاو؛ گولەم؛ خەمخۆرکە؛ ئاڤزێڵ؛ ئەستێرک؛ کەندالی بچووکی ئاودر.

**برگ / barg/**: ـها؛ ـان/: *اسم.* ١. گەلا؛ گەلا؛ پەل؛ بەلگ؛ وەلگ؛ بەلگ؛ پەژە؛ بەنگ؛ پەلک؛ ئەندامێک لە گیا کە لە بان قۆتە یان لقەوە دەردێ ‹برگ چنار: گەلای چنار› ٢. پەڕە؛ پەڕ؛ لاپەڕەی کاغەز ‹دفتر صد برگ: دەفتەری سەد پەڕە› ٣. *[ادبی]* بەرگ؛ تۆشە؛ هەگبە ‹بی‌برگ و نوا: بێ‌جلوبەرگ› ٤. *[ادبی]*

کەل‌وپەل؛ ئامرازی کار ‹ساز و برگ: کەل‌وپەل›.

◙ **برگ برنده:** ١. پەڕەی یاری بەرەوە لە پاسووردا ٢. /مجازی/ ئامراز یان قسەی زۆر کارا.

**برگ پنجه‌ای:** گەڵای پەنجەیی؛ گەڵایێ کە لێوارەکەی پلەـپلەیە و لە پەنجەی دەست دەچێ (وەک گەڵای هەنجیر و ترێ).

**برگ جریمه:** پەڕەی تاوانکاری؛ پەڕەیەک کە جۆری لادان لە قانوون و تاوانی ئەو کارەی تێیدا نووسراوە.

**برگ چغندر:** /کنایی/ تەڕەتۆڵەکە؛ تەڕەپیاز؛ پووش‌پیاز؛ گەڵاچۆنەر؛ مرۆی بێ‌نرخ؛ مرۆی هیچ‌وپووچ.

**برگ خزان:** گەڵە؛ خەزەڵ؛ خەزام؛ گازەڵ؛ گەڵای زەردی پاییز؛ گەڵاخێزان؛ گەڵای زەرد و سوور هەڵگەڕاوی خەریکی وەرین.

**برگ سبز:** ١. خام؛ چرۆ؛ گۆپە؛ گەڵای سەوز و تازە ٢. /کنایی/ ئاڵەکۆک؛ دیاری شوان؛ دیاری کەم‌نرخ.

**برگ سوزنی:** گەڵا دەرزیلە؛ پەلکە دەرزیلە؛ گەڵای باریک و نووک تیژی وەک دڕک (وەک گەڵای دار کاج).

**برگ سهام:** پەڕەیێکی چاپی بۆ فرۆش کە لە لایەن بەشدارگەیێکەوە بڵاو دەبێتەوە و خاوەن ئەو پەڕە بە بەشداری ئەو بەشدارگەیە دەژمێردرێ.

**برگ سینه:** چەپەربەند؛ مل‌پێچ؛ شاڵ‌گەردن.

**برگ شانه‌ای:** گەڵای شانەیی؛ پەلی پێکهاتوو لە زۆرێک ورتکەگەڵا، بە جۆرێک کە ورتکەگەڵاکان لە بەرامبەر یەکەوە (وەکوو شانە) ڕیز بووبێتن.

**برگ فراهم:** گرەگەڵا؛ گەڵا خڕانی لە گرەیەک کۆوە بوو.

**برگ گل:** پەلکە گوڵ؛ پەڕە گوڵ؛ گوڵەگەڵا؛ هەرکام لە پەڕەگەل یان تیکەگەلی ڕەنگینی گوڵ کە جار و بارەش بۆنخۆشە: **گلبرگ**

◙ **برگ ــ برگ شدن:** پەڕەـپەڕە بوون؛ پەلـپەل بوون؛ شەقارـشەقار بوون؛ بزڕـبزڕ بوون؛ جیا بوونەوەی لاپەڕانی پەرتووک و پەڕاو لەیەک.

**برگ دادن:** گەڵا کردن؛ پەلک لێ‌ڕوان.

**برگ زدن:** /کنایی/ فێڵ کردن؛ فریو دان؛ هەڵخەڵەتاندن.

**برگ‌آذین** / bargāzîn، ـها/: /اسم. گەڵاقەرز؛ شێوازی جێ‌گرتنی گەڵا لە دەور ساقەتە یان لقەوە.

**برگاموت** / bargāmût/: /اسم. تورنج؛ باروونە؛ بارۆنە؛ باتوو؛ باتیس: **بالنگ**

**برگ‌بو** / bargebû، ـها؛ ـیان/: /اسم. تیروو؛ تیروێ؛ دارێکی لێرەوارە بە بەرزی ١٠ تا ١٥ متر، کۆتەرەی ڕێک و لووس، گەڵای هێلکەیی و گوڵ‌سپی یان سەوز و بەرێکی بە قەد دەنکە نۆکێک: **غار**

**برگ‌بیدی** / bargbîdî/: /اسم. گوڵە مریەمێ؛ جۆرێ گوڵە کە لە ئینجانە (گوڵدان)دا بۆ ڕازاندنەوەی جێگایەک دادەنرێ، گەڵاگەلی کەسک و بەنەوشی تێکەڵە و بۆنێکی خۆشی هەیە.

**برگچه** / bargče، ـها/: /اسم. ١. پەلچە؛ پەڕچە؛ پەرکۆکە؛ وردەگەڵا؛ گەڵای چکۆلە ٢. هەرکام لە تیکەگەلی جیاوازی گەڵایەک کە لە چەند گەڵای‌تر پێکهاتووە.

**برگذاری** / bargozārî/ ☜ **برگزاری**

**برگردان**[1] / bargardān، ـها/: /اسم. ١. ئەو بەشە لە گۆرانی کە جارـجار دووپاتە

دەبێتەوە ٢. سەرقۆڵ؛ ئەو بەشە لە قۆڵی کراس یان کەوا کە بۆ جوانی هەڵدراوەتەوە ٣. وەرگێڕاوە؛ پاچڤە؛ ئەوی لە زمانێکەوە وەرگەڕاوەتەوە سەر زمانێکیتر.

**ـ برگردان**[٢]: *پیواژە.* ـوەگەڕێن؛ ـهەڵگەڕێن ‹خاک برگردان: خاک وەرگەڕێن›.

**برگرداندن** / bargardāndan/: *مصدر. متعدی.* // **برگرداندی**: هەڵتگەڕاندەوە؛ **برمیگردانی**: هەڵدەگەڕێنیەوە؛ **برگردان**: هەڵگەڕێنەوە// ١. هەڵگەڕاندنەوە؛ گەڕاندنەوە؛ هەڵگێڕانەوە؛ وەرگەڕاندنەوە؛ چوارشەکردن؛ ئەڵگەردانن؛ هێرفاندن؛ نکساندن؛ هۆرگێڵنایوە؛ هۆرەوەگێڵنەی؛ گلداین؛ بردنەوەی کەسێ یان شتێک بۆ جێگا پێشووەکەی ‹بە خانە برگرداندن: گەڕاندنەوە بۆ ماڵ› ٢. هەڵگەڕاندنەوە؛ پشت و ڕووکردن؛ ئاوەژووکردنەوە؛ هۆر وێڵنەیوە؛ داموچاندن؛ ژێرورووکردنەوە ‹یقەاش را برگرداند: یەخەکەی هەڵگەڕاندەوە› ٣. هەڵگەڕاندنەوە؛ گەڕاندنەوە؛ وەرگەڕاندن؛ هەڵچەرخاندن؛ هۆرگێڵنایوە؛ لای شتێک گۆڕان ‹سرش را برگرداند: سەری هەڵگەڕاندەوە› ٤. هاوردنەوە؛ دانەوە؛ پێدانەوە؛ ئەوەدەی ‹برگرداندن پول: دانەوەی پارە› ٥. *[مجازی]* ڕشانەوە؛ هەڵلاوردنەوە؛ هاوردنەوە؛ ئاردەیوە ‹هرچە خوردە بود، برگرداند: هەرچێکی خواردبوو، هاوردیەوە› ٦. وەرگێڕان؛ وەرگەڕاندن؛ هەڵگەڕاندن؛ پاچڤەکرن * **برگردانیدن**. هەروەها: **برگرداندنی**

■ صفت فاعلی: **برگرداننده** (هەڵگەڕێنەر)/ صفت مفعولی: **برگردانده** (هەڵگەڕێنراو)/ مصدر منفی: **برنگرداندن** (هەڵنەگەڕاندن)

**برگردانیدن** / bargardānîdan/ ☜ **برگرداندن**

**برگرفتن** / bargereftan/: *مصدر. متعدی.* *[ادبی]* // **برگرفتی**: هەڵتگرت؛ **برمیگیری**: هەڵدەگری؛ **برگیر**: هەڵگرە// هەڵگرتن؛ هەڵبژاردن؛ بەرزکردنەوە؛ هۆرگێرتەی؛ هێزدان؛ بژنین. هەروەها: **برگرفتنی**

■ صفت فاعلی: **برگیرنده** (هەڵگر)/ صفت مفعولی: **برگرفته** (هەڵگیراو)/ مصدر منفی: **برنگرفتن** (هەڵنەگرتن)

**برگریز** / bargrîz، ـها/: *صفت.* گەڵاڕێژ؛ خەزەڵوەر؛ خەزانڕێز؛ خەزانکەر؛ خاوەنی تایبەتمەندی گەڵا وەراندن بە پاییزاندا ‹بید از درختان برگریز است: بی داریکی گەڵاڕیزە›.
هەروەها: **برگریزی**

**برگریزان** / bargrîzān، ـها/: *اسم.* گەڵاڕێزان؛ گلاریژان؛ گەڵاخەزان؛ ڕەوتین؛ خەزام؛ خەزان؛ گرەژۆ؛ خەزەڵوەرین؛ دەیخەزەڵوەر؛ هەل و دۆخی پەژمران و ژاکانی گەڵایان ‹پاییز موسم برگریزان است: پاییز وەرزی گەڵاڕێزانە›.

**برگزار** / bargozār/: *صفت.* بەڕێوە چوو.

⊡ **برگزار شدن**: بەڕێوە چوون؛ کریان ‹انتخابات برگزار شد: هەڵبژاردنەکە بەڕێوە چوو›.

**برگزاری** / bargozārî، ـها/: *اسم.* بەڕێوەبەری؛ کار یان ڕەوتی بەڕێوە چوون یان بەڕێوە بردنی کارێک ‹برگزاری انتخابات: بەڕێوە چوونی هەڵبژاردن›.

**برگزیدن** / bargozîdan/: *مصدر. متعدی.* *[ادبی]* // **برگزیدی**: هەڵتبژارد؛ **برمیگزینی**: هەڵدەبژێری؛ **برگزین**: هەڵبژێرە// هەڵبژاردن؛ هلبژارتن؛ هەڵچنین؛ هۆرچنیەی؛ خەقاندن؛ مژاردن؛ نەقاندن؛ هەڵژماردن؛ وژاردن؛ هەڵبژین؛ هەڵبژنین؛ هەڵبژانن؛ دیاریکردن و جیا کردنەوەی کەسێ یان شتێک لە دەستەیەک بە مەبەستێکەوە.

■ صفت فاعلی: **برگزیننده** (هەڵبژێنەر)/

صفت مفعولی: **برگزیده** (هەڵبژێراو)/ مصدر منفی: **برنگزیدن** (هەڵنەبژاردن)

**برگزیده** / bargozîde/: *صفت.* هەژمارده؛ هەڵبژارده؛ هەڵبژارتوو؛ هەڵبژاردوو؛ هەڵبژێراو؛ هەڵبژێردراو؛ هەڵبژنیاگ؛ هەڵبژیاگ؛ هلبژارتی؛ هەڵچنیاگ؛ هۆرچنیا؛ بەربژار؛ بژارده؛ تەڵبژێر؛ قەلبژێر؛ دانەبژێر؛ سەرتەڵ؛ سەرکوڵ؛ خاسە؛ نەقێنراو؛ سەرتڵ؛ حلێب؛ نادازە؛ تەڵ؛ دیاری کریاگ؛ ناڤ گرتی.

**برگستوان** / bargostvān، ـها/: *اسم.* [قدیمی] وەرگسەوانە؛ زرێیەک کە شەڕوانان لە بەریان دەکرد یان بە ئەسپەکانیاندا ئەدا.

**برگشت** / bargašt/: *اسم.* گەڕانەوە؛ گەڕیانەوە؛ زڤر؛ گلەوخوارد؛ بەرەو دواهاتوویی: ١. هەڵگەڕانەوە؛ ئەواگێل؛ ئەوەگێڵەی؛ گل؛ زڤرینەوە ‹برایش راه برگشت نمانده بود: ڕێی گەڕانەوەی لێ بڕابوو› ٢. ـها/ *[روان‌شناسی]* جۆرێ خۆڕاگری لە بەرانبەر گوشار و گرفتی ژیانەوە کە بە شێوازی کرد و کاشی گەڕانەوە بۆ ڕۆژانی خۆشی ڕابردوو، خۆی دەردەخا ٣. *[پُست]* گەڕاندنەوەی ناردراوە بۆ ئەو کەسەی ناردوویەتی ٤. ـها/ *[ورزش]* خولی دووهەمی کێبەرکێی دوو قۆناغی ٥. *[بانکداری]* دانەوەی چەک بەو کەسە هێناویەتی ‹برگشت چک: گەڕانەوەی چەک›.

◘ برگشت دادن: گەڕاندنەوە؛ گێڵنایوە؛ ئەوەگێڵنەی؛ پێدانەوە؛ بۆ ناردنەوە.

هەروەها: **برگشت شدن**

**برگشت‌پذیر** / bargaštpazîr/: *صفت.* گەڕانەوەهەڵگر؛ بە توانایی یان هەڵی گەڕانەوە یان بەرەو دوا هاتن ‹انقلاب برگشت‌پذیر نیست: شۆرش گەڕانەوەگر نیە›.

**برگشت‌پذیری** / bargaštpazîrî، ـها/: *اسم.* گەڕانەوەگری؛ توانایی گۆڕانی ڕێ یان ڕەوت بە پێچەوانەوە.

**برگشتگی** / bargaštegî، ـها/: *اسم.* هەڵگەڕاوی؛ چەماوی؛ کۆمی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هەڵگەڕان، زڤران یان باو خواردن ‹برگشتگی لبەی جام بە طرف بیرون بود: هەڵگەڕاوی لێواری جامەکە بەرەولای دەرەوە بوو›.

**برگشتن** / bargaštan/: *مصدر. لازم.* //**برگشتی**: گەڕایەوە؛ **برمی‌گردی**: دەگەڕێیەوە؛ **برگرد**: بگەڕێوە// هەڵگەڕانەوە: ١. گەڕانەوە؛ وەرگەڕانەوە؛ وەگەڕیان؛ ڤەگەرین؛ فەتلین؛ زڤران؛ بەرەو دوا هاتن؛ بادانەوە؛ ئاوڕدانەوە؛ پێچ خواردنەوە؛ وەرسووڕانەوە؛ گل ئەوردن؛ گلەو خواردن؛ فتلین؛ هۆرگێلایوە؛ هۆرەوەگێڵەی؛ بەرەو شوێنی پێشوو ڕۆیشتنەوە ‹به خانه برگشتن: گەڕانەوە بۆ ماڵ› ٢. هاتنەوە؛ گەڕانەوە؛ گێلایوە؛ کەوتنە نێو بار یان دۆخی پێشوو ‹برگشتن سرما: هاتنەوەی سەرما› ٣. هەڵەوگەڕیان؛ سەرەونوون بیەی؛ هۆروێڵیەی؛ بەراوەژوو بوونەوە ‹برگشتن کاسه: هەڵگەڕانەوەی کاسە› ٤. گۆڕان؛ ئەڵپلیان؛ واڕیەی؛ بارەوبار بوون ‹برگشتن اوضاع: گۆڕانی بارودۆخ› ٥. هەڵەوگەڕیان؛ هۆرگێلایوە؛ دەس هەڵگرتن؛ دەس بەردان؛ پشت لێکردن ‹همه از او برگشتند: هەموو لێی هەڵگەڕانەوە› ٦. *[گفتاری]* جواب دانەوە؛ گەڕانەوە؛ گێلایوە؛ بەرپەرچ دانەوە؛ لە جواب یان بەشوێن کارێکدا، کارێک کردن ‹داشت آبروریزی می‌کرد، من هم برگشتم زدم توی گوشش: خەریک بوو ئابڕوومانی ئەبرد، منیش هەڵگەڕامەوە دامە بنا گوێیدا›.

هەروەها: **برگشتنی**

■ صفت مفعولی: **برگشته** (هەڵەوگەڕاو)/ مصدر منفی: **برنگشتن** (هەڵنەگەڕانەوە)

**برگشته** / bargašte/: *صفت.* گەڕاوە؛ هەڵگەڕاوە: ۱. خاوەن چەمیاگی بەرەو ناو یان دەرەوە ‹لبەی برگشته: لێواری هەڵگەڕاوە› ۲. کلابوو ‹بخت برگشته: بەختی هەڵگەڕاوە› ۳. *[گفتاری]* وەرگەڕاو؛ قەهاتە ‹از جنگ برگشته: لە شەڕ هەڵگەڕاوە›.

**برگشتی** / bargaštî/: *صفت.* ناردراوە؛ گەڕاوە؛ وەگەڕاوە؛ گەڕێندراوە؛ هۆرگێڵیا ‹بستەهای برگشتی را ببر انبار: بەستە وەگەڕاوەکان بەرە بۆ هەمار›.

**برگماردن** / bargomārdan/ ☜ **برگماشتن**

**برگماشتن** / bargomāštan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **برگماشتی:** داتمەزراند؛ **برمیگماری:** دادەمەزرێنی؛ **برگمار:** دامەزرێنە// دامەزراندن؛ دامەزراندن؛ دانان؛ ئەرەمەرزنەی؛ ئەرەنیای: **برگماردن**. هەروەها: **برگماشتنی**

■ صفت فاعلی: **برگمارنده** (دامەزرێنەر)/ صفت مفعولی: **برگماشته** (دامەزرێنراو)/ مصدر منفی: **برنَگماشتن** (دانەمەزراندن)

**برگە** / barge، ـها/: *اسم.* ۱. پەڕە؛ لاپەڕە؛ فیش؛ پارچە، کاغەز یان موقەبایێک کە بۆ لە سەر نووسین دەبێ ۲. *[گفتاری]* بەڵگە؛ قەواڵە؛ سەنەد ۳. لەتە؛ کوت؛ وشک کراو و پێشەدەرهاتووی میوەی گۆشتنی هاوینی ‹برگەی هلو؛ برگەی زردآلو: هەشتالووکوت؛ شێلانەکوت›.

**برگەدان** / bargedān، ـها/: *اسم.* پەڕەدان؛ بۆفیە؛ دۆلاب؛ جێی پەڕەکاغەزی دەستەدەستە و چین‌ـچین کراو.

**برلیان** / berelyān، ـها/: [از فرانسوی] *اسم.* برلیان؛ ئەلماس؛ بەردئەڵماسی داتاشراو بۆ جوانی.

**برم** / borom, b(e)rom/: [فرانسوی] *اسم.* بورۆم؛ توخمی کیمیایی ناکانزا، بە ژمارەی ئەتومی ۳۵ و کێشی ئەتومی ۷۹,۹۰ کە لە وێنەگەری و بژیشکیدا بەکاردێ: **بُروم**

**برماسیدن** / barmāsîdan/: *مصدر. متعدی. [نامتداول]* پێوەتەقاندن؛ پوەتەقنەی؛ دەس‌لێدان؛ دەست پێدا ساوین.

**برماه** / barmāh، ـها/: *اسم.* جۆرە ئامێرێکی دارتاشینە کە بۆ کون‌کردنی چێو بەکار دێت.

**برملا** / barmalā/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ئاشکرا؛ دەرکەوتوو یان دەرخراو ‹روزنامەها این مذاکرات را برملا کردند: ڕۆژنامەکان ئەم وتووێژەیان ئاشکرا کرد›.

**برنا** / bornā، ـیان/: *اسم. [ادبی]* گەنج؛ لاو؛ لاڤ؛ جوان؛ خۆرت؛ گودۆک؛ لاوک؛ لاوکۆ؛ وشاق؛ جحێل؛ جەحێل؛ جێڵ؛ جاهێڵ؛ جاهال؛ جال؛ تەرچک ‹پیر و برنا همە آمدە بودند: پیر و گەنج هەموو هاتبوون›.

**برنامە** / barnāme، ـها/: *اسم.* ڕیچ؛ بەرنامە؛ ڕێنامە؛ پەیڕەو؛ پێڕەوێک بۆ جێبەجێ کردنی کار.

▣ **برنامە چیدن:** *[گفتاری]* بەرنامە چنین؛ ڕێنامە ڕژاندن؛ پێڕەو داڕژاندن/ داڕشتن؛ پێش‌بینی‌کردنی کار و بار بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو.

**برنامەریز** / barnāmerîz، ـها؛ ـان/: *اسم.* بەرنامەڕێژ؛ پەیڕەوڕێژ؛ ئەو کەسە کاری داڕژتنی ڕێنامەیە.

**برنامەریزی** / barnāmerîzî، ـها/: *اسم.* بەرنامەڕێژی؛ پەیڕەوڕێژی.

**برنامەساز** / barnāmesāz، ـها؛ ـان/: *اسم.* بەرنامەساز؛ بەرنامەسازکەر؛ ئەو کەسەی بەرنامە (بە تایبەت بۆ ڕادیۆ یان تەلەفیزیۆن) دروست دەکا.

**برنامەنویسی** / barnāmenevîsî، ـها/: *اسم.* بەرنامەنووسی: ۱. کار یان ڕەوتی دامەزراندن و ڕێکوپێک کردنی چۆناوچۆنی

بەڕێوەبردنی کارێک بە نووسینەوەی لە سەر کاغەز ٢. نووسینەوەی پلەبەپلەی کارێکی تایبەتی بۆ جێبەجێ بوونی بە کۆمپیوتەر.

**برنبستن** / barnabastan/ ☜ **بربستن**

**برنتافتن** / barnatāftan/ ☜ **برتافتن**

**برنتـــــــوزوروس** / borontozorûs/: [؟] ☜ **بُرنتُوسُوروس**

**برنتوســـوروس** / borontosorûs، ـهـا/: [؟] /اسم. بورونتوســـورووس؛ گـــەورەتـــرین دایناسۆری گیاخۆر کە نزیک بە ٢٣ میتر درێژی و ٣٠ تون قورسی بووە.

**بـــرنج** / berenc/: اسم. بـــرینج؛ بـــرنج: ١. برنجـە؛ زەرد؛کانزای تێکەڵاوی مس و ڕۆح ٢. گرینج؛ بڕێنج؛ چەشنێکی دانەوێڵە کە بە کوڵاوی دەخورێ (دەبێتە پلاو یان کەتە) ٣. [گفتاری] پلاو؛کەتە؛ خۆراکی لە برنج دروستکراو ‹دیروز برنج خوردیم: دوێنێ برنجمان خوارد›.

**برنجاسف** / berencāsaf، ـها/: اسم. کلاوزرە؛ بـرینجداس؛ گیایەکی بیاوانیە کە زیاتر لە میترێک بەرز دەبێت، گەڵایەکی پانی پشت سپی هەیە.

**برنجستن** / barnacastan/ ☜ **برجَستن**

**برنجـک** / berencak/: اسم. گەرمشتە؛ دانە برێشکەی برنج کە وەک چەرەز دەخورێ.

**برنجکـــــوب** / berenckûb، ـهـا/: اسم. برنجکـــوت: ١. دینـــگ؛ دنـــگ؛ دەســـکوو سندۆڵ؛ هارە؛ دەستاڕ ٢. /ـان/ ئەو کەسەی کە بە دنگ کار دەکا.

**برنجکـوبی** / berenckûbî/: اسم. برنجکـوتی: ١. کاری جیا کردنەوەی برنج لە چەڵتووک ٢. /ـها/ کارگەیێک کە ئەم کارەی تێدا دەکرێ.

**برنجـی** / berencî/: صفت. برنجی؛ برنجین: ١. دروستکراو لە کانزای برینج ‹کاسەی برنجی: کاسەی برنجین› ٢. خـواردەمەنی دروستکراو لە برنج ‹نان برنجی: نان برنجی›.

**برنچیدن** / barnačîdan/ ☜ **برچیدن**

**برنخاستن** / barnaxāstan/ ☜ **برخاستن**

**برنخوردن** / barnaxordan/ ☜ **برخوردن**

**برنخیزاندن**/ barnaxîzāndan/ ☜ **برخیزاندن**

**برنداشتن** / barnadāštan/ ☜ **برداشتن**

**برنـــدگی** / bor(r)nadegî/: اسم. برشـــت: ١. تیـژی؛ بـەبڕشـتی ٢. سـووری؛ بـەبـڕی؛ پاگەزی؛ پێداگری و چەقەسرۆیی لە بڕیاردا ‹تو برندگی لازم را نداری: تۆ بڕشتی پێویستت نیە›.

**برندمیدن** / barnadamîdan/ ☜ **بردمیدن**

**برندوختن** / barnadûxtan/ ☜ **بردوختن**

**برنده** / barande، ـها؛ گان/: صفت. سەرکەوتوو؛ بەرەندە؛ بوڕ. هەروەها: **برنده بودن؛ برنده شدن**

**برنده** / bor(r)ande/: صفت. تیژ؛ تێژ؛ تیش: ١. بڕ؛ برندە؛ ببڕ؛ بوڕ؛ بەبڕ؛ بەبڕشت؛ وڕ ‹اسباب برنده: ئامێری تیژ› ٢. [مجازی] بەئازار؛ تون؛ توون ‹باران برنده: بارانی تیژ›.

**برنـــــدەبجـــا** / barandebecā/: صـــفت. بەرەندەبەجێ؛ بە تایبەتمەندی مانەوەی سەرکەوتوو و لاچوونی ئەوەی دۆڕاندوویە.

**برنـــز** / boronz, b(e)ronz/: [فرانسوی] اسم. بـرۆنز؛ مەفرەغ؛ ژیرێز؛ ئالیاژی مس و ٣٠٪ قەلع بە ڕەنگی قاوەیی ڕۆشن کە لە پەیکەرسازی و چێکردنی کەلوپەلی جۆراوجۆردا بەکاردێ.

**برنـــــزی** / boronzî, b(e)ronzî/: [فرانســوی] صفت. برۆنزی؛ مەفرەغی.

**برنـــشاندن** / barnešāndan/: مـصدر. متعـدی. [ادبی] // **برنـــشاندی**: داتنیـشاند؛ **برمـــینـشانی**: دادەنیـشێنی؛ **برنـــشان**: دانیـشێنە// دانیـشاندن؛ ئەرەنیشنەی؛ نیشاندنە سەر جێگەی خۆی.

■ صفت فاعلی: **برنشاننده** (دانیشێنەر)/ صفت مفعولی: **برنشانده** (دانیشێنراو)/ مصدر منفی: **برنَنشاندن** (دانەنیشاندن)

**برنشستن** / barnešastan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* // **برنشستی:** دانیشتی؛ **برمی‌نشینی:** دادەنیشی؛ **برنشین:** دانیشە// دانیشتن؛ نیشتن؛ ئەرەنیشتەی.

■ صفت مفعولی: **برنشسته** (دانیشتوو)

**برنشمردن** / barnašomordan/ ☜ **برشمردن**

**برنشیت** / boronšît, b(e)ronšît/: [فرانسوی] *اسم.* برۆنشیت؛ جۆرە نەخۆشینێکە بە کۆخینی توند و گرفتی هەناسەوە کە بە هۆی ماسینی سیەوە مرۆ تووشی دەبێت.

**برنکشیدن** / barnakešîdan/ ☜ **برکشیدن**

**برنکندن** / barnakandan/ ☜ **برکندن**

**برنگرداندن** / barnagardāndan/ ☜ **برگرداندن**

**برنگرفتن** / barnagereftan/ ☜ **برگرفتن**

**برنگشتن** / barnagaštan/ ☜ **برگشتن**

**برننشاندن** / barnanešāndan/ ☜ **برنشاندن**

**برنیاشفتن** / barnayāšoftan/ ☜ **برآشفتن**

**برنیامدن** / barnayāmadan/ ☜ **برآمدن**

**برنیاوردن** / barnayāvardan/ ☜ **برآوردن**

**برنیفتادن** / barnayoftādan/ ☜ **برافتادن**

**برنیفراشتن** / barnayafrāštan/ ☜ **برافراشتن**

**برنیفکندن** / barnayafkandan/ ☜ **برافکندن**

**برنینداختن** / barnayandāxtan/ ☜ **برانداختن**

**برنینگیختن** / barnayangîxtan/ ☜ **برانگیختن**

**برو** / borow, boro/: *صفت. [گفتاری]* چەلەک؛ بەلەپا؛ بەپا؛ خوەش‌ڕەفت؛ خۆش‌ڕەوت؛ ڕەجوان؛ خۆشبەز؛ بڕۆ؛ بەپێ؛ قۆچاخ؛ بڕەو؛ تاشک؛ گورد؛ گورج؛ کرژ؛ لۆیت؛ لۆتەر؛ بە توانایی باش ڕۆیشتن (زیاتر بۆ ئەسپ و ماشین و...) ‹اسبِ برو: ئەسپی چەلەک›.

**برواة** / baravāt/: [از عربی] جمعِ ☜ **بَرات**

**برو بچه** / bar-o-bače، ـها/: *اسم. [گفتاری]* ۱. مندال؛ منال؛ زار و زێچ؛ زارۆلە؛ زاولە؛ زاولێ؛ زارۆلێ؛ زارۆ؛ زارووک؛ زاروو ‹بر و بچه نداشت: مندالی نەبوو› ۲. مندالان؛ منالان؛ کەسانی سەر بە شوێنێک ‹بر و بچه‌های محل ما: مندالانی گەڕەکی ئێمە›.

**بروبر** / berr(o)ber/ ☜ **بر-بر**

**برو - برو** / boroboro/ ☜ **بُروبیا-۲**

**بروبوم** / bar-o-bûm/: *اسم. [ادبی، مجازی]* هەردوبووم؛ بەر و بۆم؛ بەر و بۆ؛ هەرد و هەوار؛ ولات؛ سەرزەوین؛ زەوین؛ زەوی؛ زەمین؛ بوومی ‹همیشه بروبومش آباد باد: تاهەتایە ئاوەدان بێ هەردوبوومی›.

**بروبیا** / borobiyā، ـها/: *اسم. [گفتاری]* ۱. هات‌وچوو؛ هات‌وچۆ؛ ئامۆشۆ؛ ئامشۆڕەفت؛ ئامەولوەی ‹توی کوچه بروبیای زیادی بود: لە کۆلاندا هات‌وچوویەکی زۆر بوو› ۲. *[مجازی]* بڕۆبڕۆ؛ دەسچوویی؛ وەج و بڕی کۆمەلایەتی ‹آن روزها بروبیایی داشت: ئەو ڕۆژانە بڕۆبڕۆیەکی بوو›: **برو- برو**

**بروت** / borût/: *اسم. [نامتداول]* سمێل؛ سوێل؛ سمێلی؛ سیول؛ سمبێل.

**بروج** / borûc/: [عربی] جمعِ ☜ **بُرج**

**برودت** / borûdat/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ساردی؛ سەردی: ۱. تەز؛ سۆلە؛ سەردا؛ سەرما ‹برودت هوا کاهش یافت: ساردی هەوا شکاندی› ۲. *[مجازی]* سڕی؛ بێ‌مەیلی.

**برورو** / bar-o-rû/: *اسم. [مجازی]* ڕەنگ و ڕوو؛ شۆخ و شەنگی؛ شەمەندی؛ پێکەوتوویی؛ لەباری؛ جوانی (بەتایبەت سەبارەت بە کچ و ژن).

**بروز** / borûz/: [عربی] *اسم.* دەرکەوتوویی؛ کار یان ڕەوتی خویا بوون و ئاشکرا بوون؛ دیاردان؛ کەوتەی سارا.

⊡ بروز دادن: ۱. نیشاندان؛ ئرمانەی ‹ضعف و سستی خود را بروز داد: لاوازی و بێ‌هێزی خۆی نیشاند› ۲. درکاندن؛ دەرخستن؛ بەلاوکردنەوە ‹حرفهایی را کە شنیده بود بە دیگران بروز داد: ئەو قسانەی بیستبووی لای ئەم و ئەو درکاندی›.

بروز کردن: سەر هەلدان؛ پەیا بوون؛ ئاشکرا بوون یان دەرکەوتن ‹میانشان اختلاف بروز کرد: کێشە لە نێوانیاندا سەری هەلدا›.

**بروشور** / burûšûr، brûšûr /: ـها/: [فرانسوی] *اسم.* بروشوور: ۱. نووسراوەی چاپی زیاتر لە دوولاپەڕە و کەمتر لە ٤٨ لاپەڕە، بێ‌بەرگ و شیرازەی تایبەت ۲. کورتە نووسراوەی چاپی سەبارەت بە تایبەتمەندی و چۆناوچۆنی کالاییک ***دفترک**

**بروم** / borom، b(e)rom /: [فرانسوی] ☜ **بُرم**

**برومند** / borûmand، barûmand /: *صفت.* پێگەیشتوو؛ بڕەدار؛ گەلەن؛ بلەرمان؛ لەشگرس ‹درخت برومند؛ جوان برومند: داری گەلەن؛ لاوی پێگەیشتوو›.

**برون**[1] / borûn /: *اسم. [ادبی]* دەرێ؛ دەرەوە؛ دەر؛ بەر؛ بەرەوە؛ دەرڤە؛ هەندەر؛ دەشت ‹کی برون را بنگریم و قال را؟: کوا هەرا و هوریای دەری چاو لێدەکەین؟›.

**برون**[2]: *قید. [ادبی]* دەر؛ دەرەوە؛ دەشت؛ بەر؛ بەرەوە؛ دەرڤە ‹برون شد یکی چشمه از کوهسار: دەرکەوت کانیەک لە کاواندا›.

**برون ـ**[3]: *پیشوازه.* دەرەوە ـ؛ دەر ـ؛ بەر ـ؛ دەرڤە ـ ‹برون‌گرا: دەرەوەگر›.

**برونبر** / burûnbar /: ـها/: *اسم.* ۱. بەشی دەرەوەی پێست و تۆکلی میوە (وەک تۆکلی گوێز و بادام) ۲. بەشی دەرەوەی پێست و تۆکلی دانەی گیا.

**برونبوم** / burûnbûm /: *اسم.* بەشێک لە زەوینی ولاتێک کە بە تەواوی کەوتۆتە نێو چوارچێوەی ولاتێکی ترەوە.

**برونریز** / burûnrîz /: *صفت. [زیست‌شناسی]* دەرەوەڕێژ؛ بە تایبەتمەندی دەلانی تراو بۆ دەرەوەی لەش. بەرانبەر: **درونریز**

**برونزا** / burûnzā /: *صفت. [ادبی]* بە تایبەتمەندی یان توانایی بەدیهاتن و گەشەکردن بە هۆی دەستێوەردانی هۆکارگەلی دەرەوەیی. بەرانبەر: **درونزا**

**برونسو** / burûnsû /: *اسم. [ادبی]* لای دەرەوە؛ دەرەوەی هەرشتێ.

**برون‌گرایی** / burûngerāyî /: *اسم.* دەرەوەگری: ۱. *[روان‌شناسی]* کار یان ڕەوتی هۆش و گۆش‌دان بە دنیای دەرەوەی لە خۆ، بە کۆمەلگا و بە خەلک. بەرانبەر: **درونگرایی**. هەروەها: **برونگرا** ۲. *[فلسفه]* ئامۆژەیەکی فەلسەفی کە دەلێ زانیاری دەرەوەیی پێشتر و لە سەرەوەی زانیاری دەروونیەوەیە ۳. *[هنر]* تایبەتمەندی بەرهەمێکی هونەری کە پێداگری لە سەر ڕووداو و دیاردەگەلی دەرەوەیی تێیدا زۆرترە ***عین‌گرایی؛ عینی‌گرایی؛ مکتب عینی**

**برونمرزی** / burûnmarzî /: *صفت.* دەرەوەی سنوور؛ پێوەندیدار بە دەرەوەی ولات.

**برون‌همسری** / burûnhamsarî /: *اسم. [جامعه‌شناسی]* هاوسەر هەلبژاردن لە بنەمالە یان هۆزێکی تر.

**برونی** / burûnî /: *صفت. [ادبی]* دەرەوەیی؛ دەرڤەیی؛ بەری.

**بره** / barre /: ـها؛ ـگان/: *اسم.* ۱. بەرخ؛ بەرخک؛ بەرا؛ وەر؛ وەرە؛ وەرک؛ وەرکە؛ وەرکەسوا؛ خفش؛ بەچکەی پەز و ئاسک تا پێنج شەش مانگان ۲. *[مجازی]* پەز؛ مەی؛ پەز پێغەمەر؛ مرۆی فەقیرۆکەی

گوێلەمستی دیتران.

**بره / bere/:** [فرانسوی] ☜ کلاه بره، **کلاه**

**بره‌آهو / barre'āhû**، ـها؛ ـان/: *اسم.* کارمامز؛ ئاسکۆلە؛ ئاسکە؛ خیف.

**برهان / borhān**، ـها؛ بَراهین/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* بەڵگە؛ پرنۆ؛ گرۆڤ؛ پازە؛ پاژە؛ بەڵسا؛ پاژ؛ بەڵگە و سەنەدی راستەقینە کە بۆ سەپاندنی دروستی بڕیار یان وتەیەک بەکار دێ ‹خودپسندی جان من! برهان نادانی بود: خۆ بە زل زانی عەزیزم! بەڵگەیە بۆ هیچ نەزانی›.

**برەتودلی / barretûdelî**، ـها/: *اسم.* ئاولەمەی پەز؛ پزەپەز؛ یاوەرەی مەڕ کە هێشتا نەزاوە، یان نەیخستووە.

**برەکشان / barrekošān/:** *اسم.* *[مجازی]* تریلیلان؛ تریلیلی؛ تلیلیلی؛ شاپلیرانی؛ گەشە و ڕەواجی کار ‹شب عیدی، برەکشان فروشندگان است: شەوی جێژن تریلیلانی فرۆشیارانە›.

**برهمائی / berahmā'î/:**[سنسکریت] ☜ **برهمایی**

**برهمایی / berahmāyî/:** [سنسکریت] *صفت.* برەهمایی: ١. پەیوەندیدار یان سەر بە ئایینی هیندوو ٢. ـها؛ ـان/ پەیڕەوی ڕێبازی هیندوو * **برهمائی**

**برهمکنش / barhamkoneš**، ـها/: *اسم.* *[فیزیک]* کردەوەی دوو یان چەند کەس یان شت لە ئاست یەکتریەوە: **اندرکُنش؛ درهمکُنش**

**برهمن / berahman**، ـها؛ ـان/: [سنسکریت] *اسم.* بەرەهمەن: ١. ئەندامی سەرەکیترین چین و توێژ لە دینی هیندوودا ٢. پێشەوای ئایینی هیندوو.

**برەموم / baremûm/:** [کردی] *اسم.* بەرەمۆم؛ بەرەمێو؛ مۆمی ڕەشی کەنووی مێشەنگوین.

**برهنگی / berahnegî, berehnegî**، ـها/: *اسم.* ڕووتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕووت بوون ‹او از برهنگی خودش خجالت می‌کشید: لە ڕووتی خۆی شەرمی دەکرد›.

**برهنه[1] / berahne, berehne/:** *صفت.* ١. ـها؛ ـگان/ پەتی؛ ڕووت؛ خاوس؛ وەروا؛ رویس؛ رووس؛ رویچ؛ تازی؛ لووت؛ لوەت؛ بێبەرگ و پۆشەن ‹پای برهنه: پای پەتی›. ٢ ـها/ قاقڕ؛ ڕووت؛ بێگیا و شینایی ‹دشت برهنه: دەشتی قاقڕ› ٣. خشت و خاڵی؛ هاڵی و هەویڵا؛ بە بێ هیچ کەلپەل و ئامرازێک ‹اتاق برهنه: ژووری خشت و خاڵی› * **لخت** ٤. ـها؛ ـگان/ *[مجازی]* هەژار؛ ڕووت؛ ڕەش و ڕووت؛ بێئەنوا؛ نەدار؛ ڕووت و قووت ‹مردم برهنه: خەڵکی هەژار›.

⊡ برهنه شدن: ڕووت بوونەوە؛ ڕووتەو بوون؛ هەموو جلوبەرگ لە بەر دەرهێنان.
هەروەها: **برهنه بودن؛ برهنه کردن؛ برهنه ماندن**

**برهنه[2]:** *قید.* بە ڕووتی؛ ڕووت؛ ڕویس؛ بە بێ جلوبەرگ ‹برهنه راه می‌رفت: بە ڕووتی دەرۆیشت›.

**برهوت / barahût/:** [عربی] *صفت.* قاقڕ؛ ئاواق؛ چۆڵ و بیابان؛ چۆڵگە؛ واق‌واق؛ کراڵ؛ بە دۆخ یان چۆناوچۆنی بێ گژوگیا و گیانلەبەر بوون ‹بیابان برهوت: دەشتی قاقڕ›.

**برهه / borhe/:** [عربی] *اسم.* ١. سەردەم؛ چاخ؛ کات؛ سات؛ دەم ٢. ـها/ *[نامتداول]* ڕۆژگار.

**بری / barrî/:** [عربی] *صفت.* بەژی؛ وشکی؛ وشکانی؛ سەر بە وشکانی یان قوڕنە.

**بری[1] / barî/:** [عربی] *صفت.* دوور؛ بەدوور؛ پاک ‹از این تهمت بری است: لەم تۆمەتە بەدوورە›.

**-بری[2]:** *پیوازه.* ـ بەری؛ کار یان ڕەوتی بردن ‹باربری: باربەری›.

**ـ بری** / borî، ـها/: *پیواژه.* ــبڕی؛ ڕەوتی بڕین ‹آهن‌بری: ئاسن‌بڕی›.

**بریان** / beryān/: *صفت.* بـرژاو؛ برژیـاو؛ برێژیـا؛ برێژیـاگ؛ براشـتی ‹مـرغ بریـان: مریـشکی برژاو›.

◘ بریـان کـردن: برژانـدن؛ بژرانـدن؛ براشـتن؛ برێژنـــەی؛ برێـشتەی؛ بریـــان کـــردن.

هەروەها: **بریان شدن**

**بریـــانی** / ber(i)yānî/: *اسـم.* ١. براشـــتی؛ برێژیـــاگ؛ گۆشـــتی بـــرژاو ٢. پلـــەگۆشـــتی سوورەوەکراو ٣. جەرگی سوورەوەکراو.

**بـری ــ بـری** / berîberî/: [فرانسوی از سینهالی] *اسم.* بیری ــ بیری؛ نـەخۆشـینێ لـە باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیادا کـە سـفتی ئـەنـدام، لـەڕی ماسـوولکەی لـەش، کـوچی، کـەمخـوێنی و ئێـشی لـەگـەلـدایە و لـە کـەمـی ویتـامین (بـەتایبـەت تیـامین) سـەر هـەلـدەدا و زۆرتـر هەژار و فەقیر تووشی دەبن.

**بریتـــــونی** / berîtonî/: [انگلیـــــسی]/*اســـم.* بریتۆنی؛ لـە زمانگـەلی سیلتی کـە لـە وێلز و کورنـــەواڵ (لـــە کـــۆ دوورگـــەی بریتانیـــا) و لـــە بورتـانی (باشـووری ڕۆژئـاوای فـەڕانـسە) قـسەی پێدەکەن.

**بـــریج** / birîc، ـهـا/: [انگلیـسی]/*اسم.* بـریج؛ جۆرێک ددانی دەسکرد.

**بریـــد** / barîd، ـهـا/: [معرب از لاتینـی]/*اسم.* [*قـــدیمی*] ١. پۆســـــتخانە؛ چاپارخانـــــە؛ ڕێخــراوەیـــەک کـــە گـــەیانـــدنی نامـــە و زانیاریگـەلی پێـوەندیـدار بـە کـار و بـاری حکوومـەتیـەوە لـە ئـەسـتۆ بـوو ٢. پـەیـک؛ تەتەر؛ چاپار.

**بریدگی** / borîdegi، ـها/: *اسم.* بـڕاوی؛ بـڕیایی؛ بـڕیاگی: ١. نیـشانەی بـڕاوی لـە شـتێکدا ٢. جێگایەک کە بڕدراوە.

**بریـــــدن** / borîdan/: مـصدر. متعـدی. لازم. //**بریـدی**: بـڕیت؛ **مـی‌بـری**: دەبـڕی؛ **بِبـر**: ببـڕە// بـڕین؛ وڕیـن؛ بڕیـەی؛ قـەلـتاندن؛ بڕینـەوە؛ قـەقوسـاندن: ◘ متعـدی. ١. قـەلـتکـردن؛ لەتکردن؛ کوتکردن؛ ئـەوەبڕیـەی؛ بڕیـەیـوە؛ شـتێک بـە ئـامرازی بـڕین (وەک کـارد، چـەقۆ، مـشار و...) لێـک جیـا کردنـەوە ‹درخـت را بریـدن: دار بڕینـەوە› ٢. شـتێک (وەک پارچـە، چەرم و ...) بە پێی نـەخـشە بـڕین ٣. کۆتـایی هێنان بـە کارێـک ‹پـایش را از اینجـا بریـدم: پـایم لێرە بڕی› ٤. بڕینـەوە؛ بڕیـەیـوە ‹بـرایش ۴ سـال زنـدان بریـدنـد: ٤ سـاڵ زینـدانیان بـۆ بڕیـەوە› ◘ *لازم.* ٥. بـڕیان؛ ورە بـەردان؛ بـێهێـز بـوون؛ هێزنـەمـان ‹از خـستگی بریـدن: بـڕیان لـە بـەر شـەکـەتی› ٦. کۆتـایی هێنـان بـە پێـوەنـدی یـان ڕاسـتیەک ‹از کـسی بریـدن: لـە کـەسێ بـڕیان› ٧. پروسـقان؛ بزرکـان؛ برووسـقیان؛ بـڕیان؛ بزرقیـەی؛ دەسـت لـە یـەک بـەردانی ‹بریـدن شـیر: پروسقانـی شـیر›. هـەروەهـا: **بریدنی**

■ صـفت فـاعلی: **بُرَنـده** (ـــ)/ صـفت مفعـولی: **بریده** (بڕاو)/ مصدر منفی: **نَبریدن** (نەبڕین)

**بریده** / borîde، ـهـا؛ ـگـان/: *صفت.* بـڕاو؛ بـڕیا؛ بڕیاگ؛ بڕیاو ‹دم‌بریده: دووابڕاو›.

**بریـــده ــ بریـــده** / borîdeborîde/: *صـفت.* بڕگـەــ بڕگـە؛ بڕکـەــ بڕکـە؛ کوتـەــکوتـە؛ چـاکــچـاک؛ لـەتـەــ لـەتـە؛ بـڕەــ بـڕە؛ بـە شێوەی یەکنەگر و دەراندەر.

**بریزوبپاش** / berîz-o-bepāš/ ☜ **ریخت‌وپاش**

**بریگـــاد** / b(e)rîgād، ـهـا/: [فرانـسوی]/*اسم.* [*نظامی، قدیمی*] بریگـارد؛ گرووپێکـی چـەکـدار کە لە چەند گوردان پێکهاتووە.

**بریـــل** / b(e)reyl/: [انگلیـسی]/*اسم.* بریـل؛ خەتی تایبـەت بـە کـوێران کـە پیتـەکـانی بـە شـێوەی نوختـەی زەق و بـە دەسـت پیـدا

هێنان دەخوێنرێنەوە: **خط بریل**

◙ **بریل سبز:** زمورووود؛ بەردێکی جوان و زۆر بە نرخە.

**بریل کبود:** یاقووتی کەوە.

**بریلیم** / berîl(i)yom/: [انگلیسی]/اسم. بریلیوم؛ توخمێکی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٤ و کێشی ئەتومی ۹,۰۱، سووک و سەخت و خۆڵەمێشی ڕەنگە: **گُلوسینیُم**

**برین** / barîn/: *صفت.[ادبی]* ئاسمانی؛ سەروین؛ سەروو؛ سەرەوەیی؛ سلال ‹بهشت برین: بەهەشتی ئاسمانی›.

**بز** / boz، ـها؛ ـان/: *اسم.* بزن؛ بز؛ بزە؛ کیەر؛ گدە؛ گدێ؛ کەگە؛ سیان؛ سێونگ؛ ڕەشانگ؛ سیاونە؛ تیشک؛ تووشتیرە.

◙ **بز اخفش:** *[کنایی]* کەڕەواڵە؛ ئەوەی کە لە شتێک تێنەگا بەڵام پەسەندی بکا.

**بز کوهی:** شقن؛ کەڵ؛ بزنە کێوی؛ کۆڤی؛ بزنە کێفی؛ بزەنەچیر؛ بزنە هەردی؛ کۆوی.

**بز نر:** حەچە؛ تەگە؛ سابرین.

◙ **بز آوردن:** *[گفتاری]* نەهامەتی هێنان؛ بەدبەختی هێنان؛ خراپە هێنان؛ قۆرت تێکەوتن؛ بە ئاکام نەگەیشتن.

**بز گرفتن:** بزبگیری کردن ☜ **بزبگیری**

**بزاز** / bazzāz، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. کووتاڵفرۆش؛ پارچەفرۆش؛ پارچەورەش؛ بەزاز.

**بزازی** / bazzāzî/: [عربی]/اسم. کووتاڵفرۆشی: ۱. کاری پارچە فرۆشی ۲. دووکانی پارچەفرۆشی.

**بزاق** / bozāq/: [عربی]/اسم. گلوێز؛ گلیز؛ گلێژ؛ لیک؛ لیکی؛ لیکاو؛ ڕینگی؛ ئاوی‌دەم.

**بزباش** / bozbāš/: [ترکی]/اسم. جۆرە خواردەمەنیەکە وەک گۆشتاو کە جار و بارە سەوزی و هیلکەشی تێدەکەن.

**بزبگیری** / bozbegîrî، ـها/: *اسم.[گفتاری]* تەڵەکە؛ فێڵبازی؛ فێڵ و تەڵەکە بەتایبەت لە مامەڵەدا. هەروەها: **بزبگیر**

◙ **بزبگیری کردن:** فێڵبازی کردن؛ فریوکاری کردن؛ فێڵ و تەڵەکە هێنانە کایەوە: **بز گرفتن**

**بزبیاری** / bozbiyārî، ـها/: *اسم.[گفتاری]* نەهامەتی؛ قۆرت؛ بارکەفتن؛ بۆ نەهاتن؛ دۆخ یان چۆنیەتی تووشی ڕووداوی ناخۆش هاتن ‹روز عروسی گرفتار یک بزبیاری حسابی شدیم: ڕۆژی زەماوەنەکە تووشی نەهامەتیەکی تەواو هاتین›. هەروەها: **بُزبیار**

**بزخری** / bozxarî، ـها/: *اسم.[کنایی]* ڕەوتی تۆپاندن؛ مردارەوکردن؛ فریودانی فرۆشەر و کڕینی کاڵاکەی بە نرخێکی زۆر هەرزان. هەروەها: **بُزخر**

**بزخو** / bozxû/: *اسم.[گفتاری]* بۆسە؛ مەلاس؛ مڵاس؛ مڵاز؛ مەلاز؛ مت؛ ماتە؛ ماتکە؛ کەمین؛ خەڵ؛ خۆداگری ‹پشت دیوار بزخو کرده بود: لە پشت دیوارەکەوە بوسەی گرتبوو›.

**بزدل** / bozdel، ـها؛ ـان/: *صفت.* بێوره؛ بێوەر؛ نەوێر؛ ترسەنۆک؛ ترسنۆک؛ ترسۆنەک؛ تەرسەزاڵ؛ ترسەزاور؛ بزدونەک؛ بێزات؛ بێزاو؛ کەلەزات؛ قەڵسەفێر؛ قزە؛ نەوێرۆک؛ مێچک؛ بێهەناو؛ بێزراو؛ کەللەزراو؛ نەمەرد؛ قەرچاڵە؛ قرچاڵە؛ خنر؛ قوزە؛ حیزەڵ؛ دلچیچک. هەروەها: **بزدلی**

**بزرک** / bazrak، ـها/: *اسم.* بەزرەک؛ گیاکەتان؛ بزر؛ ڕۆن کەتان؛ دانە پەمۆ: **بذرک**

**بزرگ** / bozorg، ـها/: *صفت.* گەورە: ۱. زل؛ گەپ؛ گر؛ بە بارستایی، پانایی یان چەندیەتی زۆرەوە ‹سنگ بزرگ: حیات بزرگ:

بەردی زل؛ حەوشی گەورە〉 ٢. بز؛ بەرچاو؛ هەڵکەوتوو؛ گرینگ؛ گرنگ 〈مرد بزرگ؛ دانشمند بزرگ؛ کار بزرگ: پیاوی گەورە؛ زانای هەڵکەوتوو؛ کاری گرینگ〉 ٣. پێگەیشتوو؛ زل؛ گیرانی 〈دختر بزرگ شده؛ پسرت بزرگ شده: کچەکەت پێگەیشتووە؛ کورەکەت گەورە بوە〉 ٤. */گفتاری/* بەتەمەن‌تر 〈برادر بزرگ: برای گەورە〉 ٥. وشەی ڕێزنان بۆ باب، دایک، خوشک، برا، مام یان خاڵ 〈پدربزرگ؛ عموی بزرگ: باوەگەورە؛ مامەگەورە〉 ٦. */لان/ [قدیمی]* مەزن؛ مەزند؛ مازان؛ مازن 〈بزرگ ده؛ بزرگ قبیله: گەورەی گوند؛ مەزنی هۆز〉.

▣ بزرگ مرد: گەورە پیاو؛ گراگر؛ گرگر؛ کەڵە پیاو؛ پیاوی ئازا و بەڕێز و جوامێر.

▣ بزرگ داشتن: */ادبی/* ڕێزلێگرتن؛ گەورە گرتن؛ ڕێز لێنان 〈ایرانیان نوروز را بزرگ می‌دارند: ئێرانیەکان نەورۆز ڕێز لیدەکرن〉.

بزرگ شدن: گەورە بوون؛ گەورا بین: ١. زل بوون؛ هەڵدان؛ هۆردەی؛ گەشەسەندن؛ بالا کردن؛ بەرز بوون 〈درخت بزرگ شده: دارەکە گەورە بووە〉 ٢. پێگەیشتن؛ گیرانی بوون 〈پسرش بزرگ شد، زن گرفت: کورەکەی گەورە بوو، ژنی خواست〉.

بزرگ کردن: گەورەکردن؛ گەورا کردن؛ پەروەردەکردن؛ پێگەیاندن؛ بارهێنان؛ پنەیاونەی 〈خودم او را بزرگ کرده‌ام: بۆخۆم گەورەم کردوە〉.

**بزرگ‌ارتشتاران** / bozorg'arteštārān/: *اسم.* *[نامتداول]* سەرۆک هێز؛ فەرماندەی تەواوی هێزی چەکداری وڵاتێک.

**بزرگان** / bozorgān/: *اسم.* مەزنان؛ مازنان؛ گەورەگەل؛ پیاوگەوران؛ گەورێ؛ گەورە پیاوان؛ پیاو ماقوولان؛ ماقوولان؛ گرگران؛ گرگران؛ مرۆڤێت مەزن 〈بزرگان قوم: پیاوگەورەکەلی خێل〉.

**بزرگپا** / bozorgpā/: *صفت.* پازل؛ پێ‌زل؛ پێ‌گەورە: ١. خاوەن بەرپێی گەورە 〈چون بزرگپا بود، آسان کفش پیدا نمی‌کرد: چونکە پازل بوو، بە هاسانی کەوشی بۆ نەدەبوو〉 ٢. لە بار بۆ پای گەورە 〈کفش بزرگپا: کەوشی گەورەپا〉.

**بزرگداشت** / bozorgdāšt، ـها/: *اسم.* ڕێزلێنان؛ کار یان ڕەوتێک بۆ پەسندکردن و پێدا گرتنی فەرمی یان گشتی لە ڕاست پلە و پایە و کەسایەتیەکەوە.

**بزرگراه** / bozorgrāh، ـها/: *اسم.* ئوتووبان؛ شارێگە؛ ڕێگای پان بە چەندین هێڵی هاتوچۆوە کە پردی تایبەت پیادەڕۆ و سوارەڕۆی هەیە و شوێنی هاتن لە چوون جیاکراوەتەوە و بۆ ڕاوەستانی ماشین جێگەی تایبەتی دیاریکراوە.

**بزرگسال** / bozorgsāl، ـها؛ ـان/: *صفت.* گەورەساڵ؛ پێگەیشتوو؛ گەورەبوو؛ گەپساڵ.

**بزرگسری** / bozorgsarî، ـها/: *اسم.* کەلەزلی؛ سەرزلی؛ سەرەزلی؛ خاوەن سەری لە ڕادەی ئاسایی گەورەتر.

**بزرگ‌سیاهرگ** / bozorgsiyāhrag، ـها/: *اسم.* شادەمار؛ هەرکام لەو دوو ڕەشەدەمارەی، خوێن دەگەڕێنێتەوە بۆ دهلیزی ڕاستی دڵ: **ورید آجوف**

▣ **بزرگ سیاهرگ زبرین:** شادەماری سەروو؛ ئەو ڕەشە دەمارە کە خوێنی سەر و سنگ دەگەڕێنێتەوە بۆ دڵ: **ورید آجوف اعلی**

بزرگ سیاهرگ زیرین: شادەماری خواروو؛ ئەو ڕەشە دەمارە کە خوێنی ئەندامگەلی خوارووی لەش دەگەڕێنێتەوە بۆ دڵ: **ورید اجوف اسفل**

**بــزرگ‌مــنش** / bozorgmaneš، ـان/: *صـفت. [ادبی]* جـوامێر؛ عـەگیـد؛ عـەگیـت؛ جـامێر؛ دلڤەرا. هەروەها: **بزرگ‌منشانه؛ بزرگ‌منشی**

**بزرگنمــایی** / bozorgnemāyî، ـهــا/: *اســم.* گەورەنوێنی؛ ڕەوتی گـەورە و گرنـگ نوانـدنی دیاردە یان ڕووداوێک.

**بزرگــوار** / bozorgvār، ـهــا؛ ـان/: *صـفت.* گەورە؛ پایەبـەرز؛ مـەزن؛ مـازان؛ مـازن؛ گـۆرە؛ گرس؛ ڕێزدار؛ خـاوەن شـان و شـکۆ، نـاوی بـە چاکـە، ئاکـاری هێـژا یـان زانـست و ئـاوەزی زۆر. هەروەها: **بزرگوارانه**

**بزرگــــواری** / bozorgvārî، ـهــا/: *اســم.* گەورەیی؛ پایەبەرزی؛ مەزنی؛ مازانی.

**بزرگــــی** / bozorgî/: *اســم.* گـــەورەیـــی؛ گــەورایــی؛ مــەزنــاهی؛ مــەزنی؛ ســەرۆکــی؛ ســەروەری: ۱. دۆخ یـان چۆنیـەتی گــەورە بوون ‹بزرگی کوه: گـەورەیـی کێـو› ۲. *[گفتـاری]* وزۆرگی ‹بزرگی بفرمایید و چند روز مهلت بدهید: گـەورەیـی بفـەرمـوون و چـەن ڕۆژێـک مـاوەمـان بدەن›.

**بــزرو** / bozrow/: *اسم.* کـوێرەڕێ؛ توولـەڕێ؛ بزنـەڕێ؛ وڵاخـەڕێ؛ کـۆرەڕا؛ ڕێکـۆک؛ ئاهـەڕا؛ ئاسـتەنـگ؛ هـشار؛ باریکـەڕێ؛ ڕێـچ؛ ڕچـە؛ کـەمــەرەڕێ؛ ڕاقــەردێ؛ توولــەڕا؛ گــەلــەڕا؛ ڕێگــەی باریــک و نارێــک کــە بــە هــۆی هاتوچووی مـرۆڤ و گیانلـەبـەرانـەوە خـۆش بـووە ‹یـک راه بـزرو هـست کـه تـا نزدیکـی غـار مـی‌رود: کـوێرەڕییـک هـەیـە دەگاتـە لای ئەشکەوتەکەوە›.

**بزغالــه** / bozqāle، ـهــا/: *اســم.* کــارژەڵــە؛ کارژۆڵـە؛ کارژیلـە؛ کـاژەڵـە؛ کـارژەلـە؛ کـار؛ کاریلە؛ بزلە؛ گێسک؛ گیسک؛ بەچکە بزن.

**بــزک** / bazak، ـهـا/: [ترکـی] *اسم. [قـدیمی]* لووسە؛ ئاڕایشت؛ خنج؛ سووراوسپیاوکاری.

**بــزک‌کــرده** / bazak.karde، ـهـا/: [ترکـی/ فارسـی] *اسـم. [تعـریض]* لووسـەدراو؛ سـاف و لـووس‌کـراو ‹گـول ایـن ماشـینهای بـزک‌کـرده را نخـوری: فریـوی ئـەم ماشـینە لووسـەدراوانە نەخۆی›.

**بزک‌ودوزک** / bazak-o-dûzak، ـهـا/: [ترکی] *اسم. [گفتـاری، تعـریض]* لا و لووسـە؛ ئاڕایـشت؛ سووراوسپیاوکاری.

**بـزم** / bazm، ـهـا/: *اسم. [ادبی]* بـەزم؛ میـوانی؛ شـایی؛ میـڤانی؛ گۆبـەن؛ گۆڤـەنـد؛ گـۆوەنـد؛ هانگ.

**بــزم‌آرا** / bazmārā، ـیــان/: *صـفت. [ادبـی]* کۆڕگێڕ؛ بەزم‌گێـڕ؛ گۆبـەنـوان؛ خـاوەن توانـایی خــۆش‌کــردنی کــۆڕی بــەزم. هـــەروەهـــا: **بزم‌آرایی**

**بزمجــه** / bozmacce، ـهــا/: *اسـم.* بـزن‌مـژە؛ بزنمـژگ؛ فـات‌فاتـک؛ قۆژیانـە؛ بـزن‌مـشک؛ حوبێ؛ کەلپەزی؛ جۆرە مارمێلکـەیـەکـی درێـژ و ئەستورە.

**بزمــرغ** / bozmorq/ ☜ شــترمرغ اســترالیایی، **شترمرغ**

**بزمگاه** / bazmgāh، ـهـا/: *اسم. [ادبی]* بـەزمگـە؛ بــەزمگـــا؛ گۆبــەنــدگا؛ جێگـــەی شـــادی و ئاهەنگ.

**بزمــی** / bazmî/: *صفت.* بـەزمـی: ۱. خـاوەن ئۆگرەتی بە بەزم ۲. پێـوەندیـدار یـان سـەر بـە بـــەزم ۳. هـــۆنراوەی کـــورتی نیـــشاندەری هەستی مرۆڤ (وەکـوو غـەزەل، چـوار خـشتەکـی و چوارێنە).

**بــزن** / bezan/: *صفت. [گفتـاری]* دەس‌وەشـێن؛ لێــدەر؛ خـــاوەن هێـــز و هـــەســـتی دەس وەشـــاندن ‹یـــارو دســـت بـــزن دارد: کـــابرا دەس‌وەشێنە›.

**بزن‌برو** / bezanboro/ ☜ **بزن و دررو**

**بــزن‌ــبــزن** / bezanbezan/: *اسم. [گفتـاری]* شەپ‌شەپـانی؛ شـەقـاوشـەق؛ شـەق‌شـەقـانی؛

شـەق‌شـەقانـێ؛ شـەڕ و داوا؛ لـە یـەک دان؛ کوتـەک‌کـاری؛ لێکـدان؛ شـەڕ و شـۆڕ ‹یـک بزن ــ بزن حسابی راه انـداخت: شـەڕشـەڕانێکی باشی خستەوە›.

**بـزن‌بکـش** / bezanbekoš/: اسم. [گفتاری] کوشـت و بـڕ؛ بکـوژ و ببـڕ؛ کوشـتن و لـەنـاو بـردن ‹روزهـای جنـگ همـەجـا بـزن‌بکـش بـود: ڕۆژانی شەڕ لە هەموو لاوە کوشت و بڕ بوو›.

**بزن‌بکوب** / bezanbekûb/ ☜ **بزن‌ُوبکوب**

**بزن‌بهادر** / bezanbahādor، ـها/: [فارسی/ ترکی] صفت. بلـەربـەزێـن؛ ببـڕ؛ بـە بڕشـت و هێـزدار ‹بزن‌بهادر اینجا خودش است: لەم ناوەدا، بلـەربـەزێن هەر خۆیەتی›.

**بزن‌دررو** / bezandar.row/ ☜ **بزن‌ُودررو**

**بزنگـاه** / bezangāh، ـهـا/: اسم. کـاتی خـۆی؛ باشـترین کـات و سـات بـۆ ئامـادە بـوون لـە شوێنێک ‹آزاد سر بزنگاه رسید: ئـازاد کـاتی خـۆی گەیشت›.

**بـزن‌وبکـوب** / bezan-o-bekûb، ـهـا/: اسم. [گفتاری] زرم و کـوت؛ مۆسـیقا و هـەڵـپەڕکـێ؛ تـەقـە و ڕەقـە؛ تـەقـەودەوڵ؛ زرم و هـۆڕ ‹تـا نصف شب در خانەشان بزن و بکوب بـود: تـا نیـوەی شەو لە ماڵیاندا زرم و کوت بوو›: **بزن‌بکوب**

**بـزن‌ودررو** / bezan-o-dar.row، ـهـا/: صفت. [گفتـاری] ڕەمـەکـی؛ بـەگـوترە؛ بلکێنـە؛ سـەرسـەری؛ بـە بـێ وردبوونـەوە و کارامـەیـی ‹او از آن صـنعتکارهای بـزن و دررو بـود: لـەو پیشەکارە ڕەمەکیانە بوو›: **بزن‌برو؛ بزن‌دررو**

**بـزودی** / bezûdî/: قید. بـەم زووانـە؛ بـەم نزیکانـە؛ بـەم زوویـیـە؛ زووبـەزوو؛ پـێ زوویـە؛ پی زووە ‹بزودی می‌رسد: بەم زووانە دەگا›.

**بزور** / bezûr/: قید. بە زۆر: ۱. بـە سـەخـتـی و دژواری ‹بزور زنـدگی خـودش را اداره مـی‌کـرد: بـە زۆر ژیـانی خـۆی دەبـردە ڕێـوە› ۲. بـەزۆرەزمـێ؛ بـەهێـز؛ بـەهـۆژم ‹بزور خودش را داخل جمعیت کـرد: بـەزۆر خـۆی خسـتە نێـو ئـاپۆرەوە› ۳. بـە پێـدا گـرتن و لـە سـەر ڕۆیـشتن ‹بزور پـول را گذاشـت تـوی جیبم: بـە زۆر پـارەکـەی خـستە نێـو گیرفانمەوە› ٤. بەزەحمەت؛ پـەحـاڵ؛ بـەحـاڵ؛ بەئاستەم؛ بـەحاسـتەم ‹بزور صـد نفر مـی‌شـدند: بەزۆر سەد کەس دەبوون›.

**بزه** / bezeh، ـهـا/: اسم. ئۆبـاڵ؛ گونـاح؛ وەبـاڵ؛ تـاوان؛ گونـەهـ ؛ گونـا؛ ئـاز و بـەزە؛ ئـاز و بـاز؛ کارێ کـە قـانوون یـا زاکـوون دەس بـۆ بـردنی پەسند ناکا و ئـەوی ئـەو کـارە بکـا، سـزای بـۆ دەبڕێتەوە.

**بزهکـار** / bezehkār، ـها؛ ـان/: صفت. تاوانبـار؛ ئازوبازەکار؛ بە چەقە؛ چەقاوەسوو؛ خووگرتوو بـە خراپەوە.

**بزهکـاری** / bezehkārî، ـهـا/: اسم. تاوانبـاری؛ تاوانکاری؛ ئازوبەزەکاری؛ چۆنیـەتی ئازوبـازەکـار بوون.

**بـژ** / baj/: اسم. تۆژاڵـی یـەخ کـە لـە سـەر بەردەوە چێ دەبێ: **بَش**

**بـژ**[1] / bej/: [فرانسوی] اسم. بۆرکـاڵ؛ ژێـڵ؛ گـەور؛ ڕەنگـی بووڵـی ئامـاڵ زەرد، وەک خوری نەشۆراو.

**بژ**[2]: صفت. ژێڵ؛ بۆرکاڵ؛ بە ڕەنگی بۆرکاڵ.

**بـس**[1] / bas/: صـفت. هنـد؛ بـەس؛ یـەزی؛ قـەس؛ وەس؛ خـاس؛ ئـەونـدەی پێویـسته ‹دوتا نان بس اسـت: دوو نـان بـەسـە›. هـەروەهـا: **بس شدن**

◘ **از بس**: ئـەوەنـدە؛ ئـەونـدە؛ ئـەونـە؛ هێنـدە؛ ئـەقـەڕڕە؛ ئێقـەڕە؛ ئـەمـەننـە؛ ئیننـە؛ ئاننـە ‹ازبس دیـر آمـدی او رفـت: ئـەوەنـدە دێر هـاتی، ئەو ڕۆیشت›.

◘ **بـس کـردن**: بـەس‌کـردن؛ برینـەوە؛ ئێتـر درێـژە نـەدان؛ تـەواوکـردن ‹دیگـر بـس‌کنیـد: ئیدی بەسی کەن›.

**بس-**[2]: پیشوانژه. زۆر؛ فرە؛ زەبـەنـد؛ مـشەمـەر

‹بسپار؛ بسشمار: زورتیکه؛ زوردانه›.
**بسا** / basā/: قید. [ادبی] زۆر؛ فره؛ پڕ؛ پتر؛ پەستا؛ مشه ‹بسا سر که افکنده شد بر زمین: زۆر سەران وا چوون به بریان›.
**بسارده** / basārde، ـها/: اسم. ئاوەنیا؛ ڕەپسته؛ دەغلێ که له پێشدا زەویەکەی ئاو دراوه و شووکراوه و دوایی تووی لێ چێندراوه.
**بساز** / besāz/: صفت. [گفتاری] تەبا؛ سازگار؛ ساچیا؛ ساچێن؛ هاوەدەنگ؛ دواڵ؛ باز؛ هاوڕێ ‹زن بساز نعمت بزرگی است: ژنی تەبا نیعمەتێکی گەورەیه›.
**بسازوبفروش** / besāz-o-befrûš، ـها/: اسم. کەسێ که کاری کردنەوه و فرۆشتنی خانووه. هەروەها: **بساز و بفروشی**
**بساط** / basāt, besāt، ـها/: [عربی] اسم. ۱. کەلوپەل؛ پسات؛ سەرجەمی شتومەک و پێداویستیەکانی کارێک ‹بساط چای؛ بساط عروسی: کەلوپەلی چای؛ کەلوپەلی شایی› ۲. دەزگه؛ دەزگه و بەره؛ دام و دەزگه؛ کار و بار ‹بساط حکومت: دەزگەی حکوومەت› ۳. مێز یان سینی دەسفرۆشان ٤. بەزم؛ بار و دۆخ (بەتایبەت ناخۆش) ‹همیشه همین بساط بود: هەر ئەم بەزمە بوو› ٥. کۆڕ؛ کۆ بوونەوه ‹دیروز بساط گرفته بودند: دوێنێ کوریان گرتبوو› ٦. ڕایخ؛ ڕایەخ؛ ڕایاخ؛ ڕاخەر؛ بەستیر؛ هەر شتێک ڕابخرێ ‹بساط سبزه لگدمال شد به پای نشاط: ڕایەخی سەوزه، سەما پاک شێلای›.
▣ **بساط چیزی را برچیدن:** دەم و دەزگای شتێ چنینەوه؛ خاپوورکردنی شتێک؛ لە بەین بردنی شتێک؛ شەنگوو چێوێوی پێتەیوه ‹بهار بساط کرسی و بخاری را برچید: بەهار دەم و دەزگای قورسی و سۆپای چنیەوه›. هەروەها: **بساط چیزی برچیده شدن**
**بساط خود را جمع کردن/ برچیدن:** [گفتاری] کەلوپەلی خۆ کۆکردنەوه؛ دەس لە کار و باری خۆکێشان؛ وێماشتەیوه؛ دەم و دەزگای خۆ کۆ کردنەوه.
**بساط کردن:** ڕانان؛ ڕاخستن؛ شتومەکی خۆ به خەڵک نواندن بۆ فرۆشتن.
**بساط کسی را برهم زدن:** [کنایی] کار و باری کەسێ تێکدان.
**بساک** / basāk، ـها/: اسم. ۱. پۆپه؛ پۆپنه؛ بەشی دوایینی پەرچەمی گوڵ که زۆرتر زەقه و دانەی تێدایه ۲. تاجی گوڵ.
**بسامان** / besāmān/: صفت. [ادبی] ڕێک وپێک؛ ساماندار.
**بسامد** / basāmad/: اسم. لەره؛ ژمارەی ئەو جارانەی که دیاردەیەکی وەگەڕ له یەکەیەکی کاتیدا چەن پاته دەبێتەوه.
**بساوائی** / basāvā' î/ ☜ **بساوایی**
**بساوایی** / besāvāyî, basāvāyî/: اسم. ۱. کار یان ڕەوتی پیاساوین؛ پێداساوین؛ پۆرەساوەی ۲. هەستی ساوین؛ هەستێ که له ڕێی دەمارگەلی ژێر پێستەوه، بڕێ تایبەتمەندی شت و دەور و بەر (وەک ساردی، گەرمی، ساف و لووسی، نەرمی، زرۆیی و...) دەناسێتەوه * **بساوائی**
**بساوش** / besāveš, basāveš/: اسم. ساوین؛ کار یان ڕەوتی پیداساوین.
**بساویدن** / besāvîdan, basāvîdan/: مصدر. متعدی. [قدیمی] دەس پێدا ساوین؛ دەس پێتەقاندن؛ دەست پێداهێنان؛ دەس پیا هاوردن؛ دەس پۆرەتەقنەی (ئەمرۆکه ئەم چاوگه فارسیه سەرف نابێ).
**بست**[1] / bast، ـها/: اسم. بەست؛ بەس: ۱. عەلقه؛ بازن؛ بازنه؛ گەو؛ چەمەر؛ نگین؛ خەلەک؛ ئاڵقه یان نیوەبازنێ که لکاوه به

چوارچێوەی درگا یان پەنجەرەوە ‹مگر این در چفت و بست ندارد؟: مەگەر ئەم دەرگایە قوڵف و بەسی نیە؟› ۲. تەنگ؛ جەڕ ‹بست شیلنگ: بەستی شلنگ› ۳. [قدیمی] کۆڕ؛ هەڤانگە؛ جێگەی مان گرتن ‹خانەی بعضی مجتهدها هم بست بود: ماڵ برێ لە گەورە مەلایانیش بەست بوو› ٤. چەسپ؛ ئەوندەی مادەیێکی (وەک تریاک، هیرۆیین، حەشیش) کە بە جارێ دەکێشرێ ‹یک بست تریاک کشید: بەستێک تریاکی کێشا›.

▣ **بست شکستن:** بەست شکاندن؛ کۆڕ تێکدان؛ گهان شێواندن؛ بە زۆر کەسێک لە بەست دەرهێنان.

**بست نشستن:** نیشنە بەس؛ جۆرێک مان گرتن.

**ـ بست**[۲]: *پیواژە.* ـبەس؛ ـبەست: ۱. نێوساز ‹داربەست: داربەس› ۲. ئاوەڵناوساز ‹دربست: دەربەست›.

**بستاب** / bastāb، ـها/: *اسم.* ماش؛ بەریان؛ ئاوبڕ؛ پەنگاو؛ بەربەندی کاتی بۆ بەرگری لە ڕخنەی ئاو تا دوایی هاتنی کارێک.

**بستان** / bostān، ـها/: *اسم.* [ادبی، مخفف] بێسان؛ بێستان؛ بووسان؛ بۆسان؛ بوێسان.

**بستان‌افروز** / bostānafrûz/ ☜ **تاج‌خروس**

**بستانکار** / bestānkār، ـها؛ ـان/: *اسم.* خاوەن قەرز؛ کەسێ قەرز دەدا بە قەرزدار.

**بستر** / bastar, bestar، ـها/: *اسم.* ۱. [ادبی] جێگە؛ جا؛ جێگەوبان؛ جێوبان؛ یاگێ؛ یاگۆبان؛ نڤینک ‹بستر انداختند و خوابیدیم: جیگەیان ڕاخست و نووستین› ۲. مەرخ؛ تەخت؛ شوێنی پێداچوونی ئاو ‹بستر رودخانە: مەرخی ڕووبار› ۳. [مجازی] بەستێن؛ بووز؛ بار و دۆخی پێویست بۆ بەدیهاتنی شتێک.

▣ **از بستر بیماری برخاستن:** لە ناو جێدا هەستانەوە؛ چاک بوونەوە و ئیدی لە جێگەدا نەبوون.

**به بستر بیماری افتادن:** کەوتنە جێگە؛ کەوتنە ناو جێ؛ کەوتەی دلێ یاگێ؛ کەوتەینە یاگێ؛ نەخۆش کەوتن و لەجێگەدا جێگیر بوون.

**به بستر رفتن:** چوونە ناو جێوە؛ چوونە ناو جێگە بۆ خەوتن.

**بستری** / bastarî, bestarî، ـها/: *صفت.* بانەجا؛ لەجێ‌کەوتوو؛ ناو جێگەکەوتوو ‹بیمار بستری: نەخۆشی بانەجا›.

▣ **بستری شدن:** کەوتن؛ نووستنی نەخۆش؛ کەوتنە جێگەوە؛ کەفتنە ناو جێگە.

**بستری کردن:** خەواندن؛ خەفاندن؛ وسنەی ‹مریض را در بیمارستان بستری کردند: نەخۆشەکەیان لە نەخۆشخانەدا خەفاند›. هەروەها: **بستری بودن**

**بستگان** / bastegān/: *اسم.* ۱. خزمان؛ خوێشان؛ خزم و کەس؛ کەس و کار؛ کەسانێ کە پێوەندی خزمایەتیان هەیە ‹بستگان درجەی یک: خزمانی زۆر نزیک› ۲. نزیکان؛ نزیکێ ‹خویشان و بستگان: خزمان و نیزیکان›.

▣ **بستگان درجەی یک:** خزمانی زۆر نزیک کە بریتین لە باب، دایک، خوشک، برا، هاوسەر یان منداڵی هەر کەسێک.

**بستگی** / bastegî، ـها/: *اسم.* پەیوەندی؛ بەستەیی ‹این بستگی دارد بە قدرت مالی شما: ئەمە پەیوەندی بە توانی ماڵی ئێوەوە هەیە›.

**بستن** / bastan/: *مصدر. متعدی. لازم.* // **بستی:** بەستت؛ **می‌بندی:** دەبەستی؛ **ببند:** ببەستە //

☐ *متعدی.* ۱. بەستن؛ بەستنەوە؛ بەسن؛ بەسەی؛ بینایوە؛ شەتەکدان؛ شتێک بە بەن یان بە گرێ، بەشتێکی ترەوە توندکردن ‹بە درخت بستن: بە دارەوە بەستن› ۲. بەستن؛

بەسـن؛ داخستن؛ ژەندن؛ پێوەدان؛ دەی پوە؛ ژەی؛ ژەنای؛ ژەنتەی؛ قووچاندن؛ ئاژنین؛ بەندکردن؛ بەسەی؛ بینتەی؛ هەڵپێکان؛ ئەڵکپان؛ ڕێگە و بازێک یان بەری جێگایەک بەن کردن ‹در بستن: دەرگا ژەندن› ٣. بەستن؛ داخستن؛ بەسن؛ پێتەیوە؛ بینەی؛ گاڵە دان ‹روزنامەها را بستن: ڕۆژنامەگەل داخستن› ٤. بەستن؛ بەسن؛ دانە یەک؛ لێکنان؛ دەی پێوەرە ‹کتاب را بستن: کتێب دانەیەک› ٥. بەستن؛ بەسن؛ ئەوەبینەی؛ بەسەیوە؛ ئازادی لە کەسێک سەندن ‹دست، دهان یا پای کسی را بستن: دەست، دەم یان پێی کەسێک بەستن› ٦. دانان؛ برینەوە؛ بڕیار دەرکردن ‹مالیات بستن: پیتاک دانان› ٧. هەڵبەستن؛ هۆربەسەی ‹به کسی دروغ بستن: درۆ بۆ کەسێک هەڵبەستن› ٨. هێنان؛ دەرهێنان؛ بەستنە بەر؛ بە شێوە یان شێوازێکی تایبەتی دەرهاوردن ‹به کار بستن: بە کار هێنان› ٩. دانە بەر؛ داگرتنە بەر ‹به توپ بستن: دانە بەر تۆپ› ١٠. بەستن؛ بەسن؛ برینەوە؛ بەستەی؛ بینای؛ کۆتایی هێنان بە ڕەوتێک؛ تەواوکردن ‹حساب را بستن: حەساو بەستن› □لازم. ١١. بەستن؛ بەسران؛ گرسان؛ گرسەی؛ مەیین؛ بینەی؛ سفت و خەست بوونەوە ‹بستن ماست؛ بستن یخ: مەییی ماست؛ گرسانی سەهۆڵ› ١٢. بەستن؛ بیچمێکی تایبەتی بە خۆ گرتن ‹صف بستن: ریز بەستن›. هەروەها: **بستنی**

■ صفت مفعولی: **بسته** (بەستراو)/ مصدر منفی: **نَبستن** (نەبەستن)

**بستنی** / bastanî/: اسم. دۆندرمە؛ دۆڵدرمە؛ چلوورە؛ بەستەنی؛ بەسەنی؛ شیر و شەکری سۆڵ بەستوو.

**بستنی‌ساز** / bastanîsāz، ـها/: اسم. بەستەنی‌ساز؛ بەستەنی دروستکەر: ١. کەسێ کە بەستەنی دروست دەکا ٢. کەرەسەی سازکردنی بەستەنی. هەروەها: **بستنی‌سازی؛ بستنی‌فروش؛ بستنی‌فروشی**

**بستو** / bastû/: اسم. گۆزەڵە؛ گۆزک؛ گۆزەڵێ؛ گۆزەی پچۆکە؛ گۆزکە؛ کووپەڵە؛ خلک؛ جەڕک؛ گۆزەی چکۆلەی سەر ئاوەڵا.

**بستوغه** / bastûqe/: اسم. بستووگە؛ قادوول؛ کووپەڵەی زارتەنگ.

**بسته** ¹ / baste، ـها/: اسم. بەسە؛ بەستە؛ بەسێ: ١. بەند؛ پۆشەنێ کە شتێکی تێدایە ‹بستەی کاغذ: بەستەی کاغەز› ٢. مووچە؛ مووچێ؛ دەستە؛ دەسە؛ هەندێ لە شتێ کە لە نێو شتێکەوە پێچراونەتەوە ‹چهار بسته نان: چوار مووچە نان›.

**بسته** ²: صفت. ١. گیراو؛ بەسراو؛ پۆشیاگ ‹از همه طرف بسته است: لە هەموو لایێکەوە بەسراوە› ٢. داخراو؛ قفڵدراو؛ ژنیاگ؛ ژەنیاگ؛ جەلە؛ بینیا؛ ژنیا ‹راه بسته؛ درِ بسته؛ قُفلِ بسته: ڕێگای بەسراو؛ درگای داخراو؛ قوفڵی ژنیاگ› ٣. [نامتداول] بەستوو؛ گرساو؛ گرسیاگ؛ سفتەوبووگ؛ بیا؛ ڕەق هەڵاتوو ‹روغن بسته: ڕۆنی بەستوو›.

**بسته‌بند** / basteband، ـها/: اسم. بەستەبەند؛ دەسکەبەند؛ جەڕەبەن: ١. کەسێ کە کاری بەستەبەندیە ٢. ئامرازی بەستەبەندی.

**بسته‌بندی** / bastebandî، ـها/: اسم. بەستەبەندی؛ دەسکەبەندی.

**بستی** / bastî، ـها؛ ـان/: اسم. مانگرتوو؛ بەست دانیشتوو؛ کەسێ بۆ پەنا چۆتە بەستەوە.

**بسختی** / besaxtî/: قید. ١. بە سەختی؛ هاوڕێ لەگەڵ بەکار بردنی هێز و پێداگری زۆرەوە ‹آن سال بسختی کار کرد: ئەو ساڵە

بەسەختی کاری کرد〉 ٢. بەدژواری؛ بە سەختی؛ بە ئاریشە؛ سەخڵەت 〈زندگیش بسختی گذشت: ژیانی بە دژواری تێپەڕ بوو〉 ٣. بەتووڕەیی؛ بە ناو چاوتاڵی 〈با او بسختی رفتار کرد: بە تووڕەیی لەگەڵیدا جووڵاوە〉 ٤. پیس؛ زۆر؛ خراپ 〈بسختی ویران شد: پیس خاپوور بوو〉.

**بسد** / bossad، ـها/: *اسم. [قدیمی]* مەرجان.

**بسزا** / besazā, beseză/: *قید. [ادبی]* باش؛ ئەوتۆ؛ شیاو؛ بە دروستی 〈گفت من رقص ندانم بسزا: گوتی خۆ من باش نازانم هەڵپەڕم〉.

**بس‌شماری** / bassomārî/ ☜ **ضرب**

**بس‌شمر** / bassomar/ ☜ **مضروبٌ فیه**

**بش‌شمرده** / bassomorde/ ☜ **مضروب**

**بسط** / bast/: [عربی] *اسم.* پەرە؛ گەشە 〈بسط آزادیهای اجتماعی: پەرەی ئازادیگەلی کۆمەڵایەتی〉.

▣ **بسط دادن:** پەرە پێدان؛ گەشە پێدان 〈بسط دادن بە این بحث، رسیدن بە نتیجە را دشوار می‌کند: پەرە پیدانی ئەم باسە، گەیشتن بە ئاکام دژوار دەکاتەوە〉.

**بسفراوری** / basfarāvarî، ـها/: *اسم. [اقتصاد]* بەکۆسازی؛ بەری مشەمەر؛ کار یان ڕەوتی دروستکردنی کاڵا و شتومەک بە فراوانی.

**بسک** / bask، ـها/: *اسم.* پرشە؛ پلاشە؛ پریشک؛ پرژە؛ پرژە؛ وردە کانزای دوای تەقینەوە.

**بسکتبال** / basketbāl/: [انگلیسی] *اسم.* بەسکیتباڵ؛ یاریەکی بە گەلە کە لە زەوی تایبەتدا لە نێوان دوو دەستەی پێنج کەسیدا دەکرێ، بەو جۆرە کە هەر دەستە هەوڵ دەدا تۆپەکە بخاتە نێو بازنە (سەبەتە)ی ئەو دەسەکەی ترەوە کە لە ئەم پەڕ و ئەو پەڕی زەویەکەوە هەڵواسراوە.

**بسکتبالیست** / basketbālîst، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* بەسکیتباڵیست؛ یاریکاری گەمەی بەسکیتباڵ.

**بسلامت** / besalāmat/: [فارسی/ عربی] *دعا. [گفتاری]* وەسلامەت؛ بەسەلامەت؛ بەدۆعا (لە جوابی خوداحافیزیدا دەگوترێ).

**بسلامتی** / besalāmatî/: [فارسی/ عربی] *دعا.* خودا یار بێ؛ بە سلامەتی 〈بسلامتی کی برمی‌گردد؟: خودا یار بی کەی دێتەوە؟〉.

**بسم‌الله** / besmellāh/: [عربی] *دعا.* ١. بەناو خودا؛ وەناو خودا؛ بە نامێو خوای ٢. *[گفتاری]* دەیسا فەرموو؛ دەفەرموو؛ فەرماوە؛ کەوابوو دەس پێکە 〈اگر مرد راهی بسم‌الله: ئەگەر پیاوی ڕێگای دەیسا فەرموو〉.

**بسندگی** / basandegî/: *اسم. [ادبی]* بەسندەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەس بوون.

**بسنده** / basande/: *صفت.* بەس؛ وەس؛ بەسندە؛ بە ئەندازەی پێویست.

▣ **بسنده بودن:** بەش کردن؛ بەس بوون؛ وەسێ کەردەی 〈پولی کە داشتند برای گذران زندگیشان بسنده بود: ئەو پارەی هەبوویان بۆ بەڕێوە بردنی ژیانیان بەس بوو〉.

**بسنده کردن:** قنیات کردن؛ ڕەزادان؛ داوای زیاتر نەکردن.

**بسودن** / besûdan/: *مصدر. [ادبی]* ١. ساوین؛ ساوەی؛ ساوای ٢. سمان؛ سمەی؛ کون کردن.

**بسی**[1] / basî/: *قید. [ادبی]* زۆر؛ یەکجار؛ ئێجگار؛ گەلەک؛ گەلێ؛ فرە 〈بسی رنج بردم در این سال سی: زور ئازارم چەشت لەم سی ساڵەدا〉.

**بسی**[2]: *ضمیر.* زۆری؛ زۆرێک؛ زۆر؛ فرە؛ فرێ؛ گەلێ 〈چون نگە می‌کنم نماندە بسی: ئەگەر دەڕوانم زوری نەماوە〉.

**بسیار**[1] / besyār/: *صفت.* زۆر؛ زاف؛ پڕ؛

گەلێک؛ گەلە؛ گەلەک؛ زەحف؛ زیاد؛ زێدە؛ فرە؛ مشە؛ مشەمەر؛ زەوەند؛ زەبەند؛ هەمکە؛ حەمکە؛ زیە؛ گەلێ؛ گەلێک؛ گەلێر؛ بۆش؛ پوڕ؛ فت؛ هەندێ؛ هێل؛ ئێکجار؛ ئیگجار؛ ئێجگار؛ یەکجار؛ فرفرە؛ هۆ؛ فریە؛ زیا؛ زەوەن؛ پەکی ‹کار بسیار: کاری زور›.

**بسیار**[٢]: *قید.* زۆر؛ فرە؛ فرێ؛ بەزۆری؛ زۆرێک؛ گەلەکی ‹بسیار گفت: زۆری گوت›.

▣ **بسیار شدن**: زۆر بوونەوە؛ زاف بوونەوە؛ فرە بوونەوە.

**بسیار کردن**: زۆرکردن؛ فرەکردن؛ چەند جار دووپاتکردنەوە.

**بسیاری** / besyārî/: *اسم. [ادبی]* زۆری؛ فرەیی؛ پڕایی ‹از بسیاری مردم مجال حرکت نبود: لە بەر زۆری خەلک جێی جوولانەوە نەبوو›.

**بسیاری**[١] / besyā:rî/: *صفت.* زۆرێک؛ زۆرێ؛ فرەو؛ فرەیێک؛ هێلێ ‹بسیاری از گلها درآمده‌اند: زۆری لە گولەکان دەرهاتوون›.

**بسیاری**[٢]: *ضمیر.* زۆرێک؛ گەلێک؛ فرەیەک؛ فرێو ‹بسیاری را سرما زد: زورێک سەرما بردنی›.

**بسیج** / basîc/: *اسم.* مینەق: ١. بەرهەڤکری؛ کار یان ڕەوتی کۆوەکردن و سامان دان ٢. ڕێخراوەیەک لە کۆمای شەڕڤانان.

▣ **بسیج زورکی**: زۆربگیری؛ ڕەشبگیری.

**بسیج عمومی / همگانی**: مینەق؛ مینەقی گشتی؛ بەرهەڤکری هەموانی خەلک.

▣ **بسیج کردن**: بەرهەڤکردن؛ کۆوە کردنەوە و ڕێکخستنی کەرەسە و هێزی پێداویستی کارێک: **بسیجیدن**. هەروەها: **بسیج شدن**

**بسیجیدن** / basîcîdan/ ☜ بسیج کردن،

**بسیج**

**بسیط** / basît/: [عربی] *صفت.* ١. *[نامتداول]* بەربلاو؛ بەرفراوان؛ بەرپان؛ بەرین؛ پان؛ هەراو؛ فرەه ٢. ساوا؛ سادە؛ سانا؛ هاسان؛ ناتێکەڵ ‹اسم بسیط: ناوی سادە›.

▣ بسیط زمین: *[ادبی]* سارا؛ پانایی زەوی.

**بش** / baš، ـها/: *اسم.* ١. ☜ **بژ** ٢. یال؛ تووکی سەر ملی هێستر، ئەسپ و ولاخ و...

**بشارت** / bešārat، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* مزگێنی؛ مزگانی؛ مزگینی؛ مزانی؛ موژدە؛ نزانی ‹نسیم باد نوروزی صبا را خوش بشارت داد: مزگێنی دا بە سروە بای بەهاری›.

**بشاش** / baššāš/: [عربی] *صفت.* ڕووگەش؛ خۆشڕوو؛ ڕووخۆش؛ ڕۆگوشاد؛ خەنۆک؛ وەشڕوو؛ خەندەران؛ خەنەران؛ شاد.

**بشاشت** / bašāšat/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ڕووگەشی؛ ڕووخۆشی؛ خەنەرانی؛ شادمانی.

**بشاورد** / bašāvard/: *اسم.* گەوە؛ گەوەک؛ زەوینی پڕ لە دۆڵ و تەپۆلکە.

**بشخصه** / bešaxse/: [فارسی/ عربی] *قید.* بۆ خۆم؛ خۆم؛ خودی خۆم؛ وێم ‹من بشخصه او را نمی‌شناسم: من بۆ خۆم ئەو ناناسم›.

**بشر** / bašar/: [عربی] *اسم.* مرۆڤ؛ مرۆ؛ بنیادەم ‹حقوق بشر: مافی مرۆ›.

**بشردوست** / bašardûst، ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* مرۆڤدۆست؛ هۆگری مرۆ.

**بشردوستانه** / bašardûstāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* مرۆدۆستانە.

**بشردوستی** / bašardûstî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* مرۆڤدۆستی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خۆشویستنی خەلک و ئۆگرەتی بە هاودەردی و یارمەتی دانیان.

بــــشره / bašare/: [عربـــی]/اســم. ۱. /ــهـــا/ [نامتـداول] بــیچم؛ تــەشــک؛ کــەســم؛ سـیما؛ ڕواڵـــەت؛ ڕوومـــەت؛ چـــار؛ نـــژم؛ وێنـــە ۲. [کالبدشناســی] ســـەرپێـــست؛ تـــوێژە؛ تـــوێژاڵ؛ ڕۆچـــەم؛ چـــەرم ۳. [گیـاەشناسـی] تـــۆکڵ؛ توێکڵە؛ پێست؛ پۆس.

بـــشری / bašarî/: [عربـــی] صـفت. مرۆڤـــی؛ ئینسانی؛ پێوەندیدار یان سەر بە مرۆڤ.

بـــــشریت / bašarîyyat/: [عربــــی]/اســـم. مرۆڤـایەتی: ۱. مرۆڤـێتی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی مـرۆڤ بـوون ‹همکـاری لازمـەی بشریت است: ئاریکـاری پێداویـستی مرۆڤـایەتییـە› ۲. مـرۆڤ؛ ئینـسان؛ کـۆی مـرۆڤ ‹جنگ‌افزارهـای هـستەای بشریت را تهدیـد مـی‌کنـد: کـەرەسـەگـەلی نـاوکی گورەشەیەکـن بـۆ مـرۆڤ› ۳. مرۆڤـێتی؛ ئاکـاری مرۆڤایەتی؛ خوو و خدەی مرۆڤانە.

بـشقاب / bošqāb، ـهـا/: [ترکـی]/اسـم. دەوری: ۱. سـیمیک؛ قـاپی؛ قـاو؛ پـەل؛ دەفـری پـەل؛ گۆشـقاب؛ قۆشـتاب؛ پێـشدەسـتی ۲. ئـەوەی لە ناو دەفـردا بـێ ‹ناهـار پلـو داشـتیم یـک بشقاب خوردم: نیوەڕۆ پلاومان بوو دەوریـەکم خوارد›.

▣ بـشقاب تخـــت: دەوری تـــەخـــت؛ دەوری برنجخۆری؛ دەوری ساف و نەقووڵ.

بـــشقاب گـــود: دەوری قـــووڵ؛ دەوری خۆرشـتخـۆری؛ دەوریـەک کـە لێـوارەی هەبێ.

بـشقابی / bošqābî/: [ترکـی] صفت.گۆشـقاپی؛ دەفری؛ دەوری‌ئاسا.

بـشکاف / beškāf، ـهـا/:/اسم. [خیاطی] درەوشـە؛ درۆشە؛ کەرەسەیـەک بـۆ کـون‌کـردن و ئـاوەڵ کردنی تلیش و بازکردنی جێ‌کلانە.

بشکن / beškan، ـها/:/اسم. چەقونـە؛ چـەقـەنـە؛ چـەقوانـە؛ فنـق؛ پـل؛ پلـێ؛ بـستە؛ چـەقانـە؛ چەقەنـە بـە پـەنجـە؛ تـەقـەتـەق بـە لێکـدانی قامکە گەورە و بالابەرزە.

▣ بشکن زدن: پل تـەقـانن؛ چـەقـەنـە لێدان؛ فنـق شـکانن؛ پـل تـەقانـدن؛ پـل‌تـەقانـێ کردن؛ پلێ تەقنەی؛ بستە لێدان؛ تـەقـە لـە پتە هێنان؛ تل لێدان؛ چەقەنە بە قامک.

بـــشکه / boške, bošge، ـهـا/: [روســی]/اسـم. بـەرمیـل؛ دەرم؛ بۆشـکە؛ کـۆس: ۱. داریـل؛ دەفـری گـەورەی داریـن بـۆ تـراو؛ کووپـەی داری سـەرگـیراو ۲. دەفـری هـەراو لـە کـانزا بۆ تراو تێ‌کردن ۳. ئەوەی لـە نـاو بۆشکەدایـە ‹چهـار بـشکه نفـت: چـوار بوسـکە نـەوت› ٤. یەکـەی داهـاتی نـەوتی، بـەرامبـەر بـە ۱۵۹,۸ لیتـر ‹روزی چهـار میلیـون بـشکه نفـت اسـتخراج مـی‌کننـد: ڕۆژێ چـوار ملیـۆن بوشـکە نـەوت دەردێنن›.

بـشم / bašm/:/اسـم. ئاڵـشک؛ ئاڵـشت؛ سـیخ؛ ســیخوار؛ ســیخار؛ خووســار؛ خـــووس؛ خـــوویس؛ خـــوێس؛ خوویـــسار؛ خیـــسار؛ خوویـسک؛ زوقـم؛ قـورۆ؛ قـڕ؛ شـەڵـتە؛ قـڕاف؛ خـــوێز؛ خـــوویز؛ خـــوزە؛ خـــازی؛ ســـووخ؛ بـەرفـۆک؛ پـژ؛ خوسـار؛ ئاڵـشتە؛ پـەتیـل؛ زق؛ خویز؛ بەژ؛ داناری زۆر وردی یـەخ و بـەفـر کـە لە سەرمادا، دار و بەرد دادەپۆشێ.

بـــــشوروبپوش / bešûr-o-bepûš/: صـــفت. لۆچهەڵـنـەگـر؛ قومـاش یـان جلکـێ وا کـە بـە شۆردن لۆچ نابێ.

بـشیر / bašîr، ـان/: [عربی]/اسم. [ادبـی، نامتـداول] مـژدەدەر؛ مـزگێنیهێنـەر؛ نـزانیدەر؛ کـەسـێ کە مزگانی پێ بێ.

بـصر / basar، ـهـا؛ آبـصار/: [عربـی]/اسم. [ادبـی] چـاو؛ چـاف؛ چـەم؛ چـەو؛ چـەهـڤ ‹نـور بـصر: سۆمای چاو›.

بـــصری / basarî/: [عربـــی] صـفت. ۱. چـــاوی؛ چاڤـــینی؛ پێـــوەندیـــدار بـــە چـــاوەوە ‹اعـــصاب بصری: دەمـاری چـاوی› ۲. دیـتنی؛ پێـوەندیـدار بە بینایییەوە.

**بــصل‌النخـــاع** / basalonnoxā' /: [عربـی] /اسـم. خـوارترین بەشـی مێـشک کـە کـاری میـزان کـردنی نەفـەس کێـشان، دڵ لـێدان و... بـە دەسیەتی.

**بــصیر** / basîr ، ـان/: [عربـی] صـفت. چـاوکراوە؛ ڕێبین؛ شارەزا.

**بــصیرت** / basîrat /: [عربـی] /اسـم. ١. [نامتـداول] سـۆما؛ بینـایی؛ وینـایی ٢. بینـشت؛ ژیرڤـانی؛ ئاگەهـی؛ مینـایی؛ زیـرەکـی؛ ئاگـایی دەروونی لە شتێک.

**بـضاعت** / bezā'at, bazā'at ، ـها/: [عربی] /اسـم. [ادبی] دەسمایـە؛ سـەرمایـە؛ پێـداوە؛ دەوڵـەت؛ مایە؛ دەزمایە؛ کەل‌وپەل؛ سامان.

▣ **بـضاعت مزجـات**: [ادبی] ١. مایـەی کـەم ٢. [مجازی] زانستی کەم؛ کەم باری.

**بط** / bat ، ـها؛ ـان/: [عربی] /اسم. [ادبی] مـراوی؛ مامرئاوی؛ مەراقی؛ مراویە.

**بطالــت** / betālat, batālat /: [عربـی] /اسـم. ١. خـۆرایی؛ فیـڕۆیی؛ بـێ‌هـۆیی؛ بێهـوودەیـی؛ بـێ‌قـازانجی؛ بـێ‌کـەڵـکی ‹عُمـر بـە بطالـت بگذشـت: تـەمـەن بـە خـۆرایی چـوو› ٢. خوێریەتی؛ تەپلمۆسـی؛ تـەپـەلۆسـی؛ بێکـاری؛ هـیچ‌وپـووچی ‹یـک سـال را بـە بطالـت گذرانـد: ساڵێکی بە بێکاری تێپەڕاند›.

**بطانه** / batāne /: [عربی] ☜ **بتانه**

**بطــر** / botr /: [از فرانـسوی] /اسـم. [گفتـاری] ١. شووشە؛ شیشە؛ بـتڵ ٢. یـەکـەی تـراو پێـوان، بـەرامبـەر بـە ٦٠٠ میلـی‌لیتـر ٣. [؟] بـارێکی نالەبار لە گەمەی قاپێندا.

▣ **بطـر آوردن**: [گفتـاری] هـەڵـشکان؛ دانـانی قومار؛ دۆڕان.

**بطـری** / botrî ، ـها/: [از فرانسوی] /اسم. بـوتڵ: ١. بـوتری؛ بتـری؛ شووشـە؛ مینـا؛ دەفـری لـەحـام؛ شووشـەی دەم‌تـەنـگ بـۆ تـراو تـێ کـردن ‹بطری شیر: بوتڵی شیر› ٢. هـەر ئـەو شیـشە بـەو شـتەوە کـە تێیدایـە ‹بطـری را سرکشید: بوتڵەکەی نایە سەرەوە›.

**بطریــرک** / batrîrak ، ـها؛ ـان/: [از یونـانی] /اسـم. بـاتریرەک؛ سـەرەناوێـک بـۆ سـەر ئوسقوفانی کلێسەی ئورتودوکس: **بطریق**

**بطریــرک‌نــشین** / batrîraknešîn ، ـها/: [از یونـانی/ فارسـی] /اسم. نـشینگەی بـاتریرەکـان؛ ناوچـەی ژێـردەسـەڵاتی ڕۆحـانی بـاتریرەک: **بطریق‌نشین**

**بطــری‌شــور** / botrîšûr ، ـها/: [از فرانـسوی/ فارسـی] /اسم. شووشـەشـۆر؛ شیـشەشـۆر؛ ئـامرازێکی میلـەئاسـا کـە ڕیـشاڵی زرۆ بـە سـەرێکیـەوە پێچـراوە و بـۆ شـۆردنی نـاو شووشە بە کەڵک دێ: **شیشەشوی**

**بطریــــق** / betrîq /: [معـرب از یونـانی] ☜ **بَطریرک**

**بطریــق‌نـشین** / betrîqnešîn /: [معـرب از یونـانی/ فارسی] ☜ **بَطریرک‌نشین**

**بطـلان** / botlān ، ـها/: [عربی] /اسم. کـار یـان ڕەوتی پووکانـەوە؛ پـووچ بوونـەوە؛ پووچـەڵ بوونـەوە؛ هـەڵـوەشـانەوە؛ بـەتـاڵ بوونـەوە؛ بـە فشە دەرچوون.

**بطــن** / batn ، ـها؛ بطـون/: [عربـی] /اسـم. ١. [نامتــداول] گـــەد؛ کـــرش؛ ســـک؛ نـــاوزگ؛ ناوسک؛ زک؛ ئۆچک؛ ورگ؛ لـەمـە؛ ئـەشـقەمـە ‹بطـن مـادر: نـاوزگی دایـک› ٢. نـاخ؛ نـاوەرۆک؛ ناودڵـی شـتێک؛ نـاوەکـی‌تـرین بـەشـی هـەر شـتێک ‹او در بطـن مـاجرا بـود: ئـەو لـە نـاخی ڕووداوەکەدا بوو›.

**بطون** / butûn /: [عربی] جمعِ ☜ **بطن**

**بطیٔ** / batî' /: [عربی] صفت. [ادبی] هێـور؛ خـاو؛ یاو؛ هێـدی؛ ئـەسـپایی؛ هێـواش؛ لـە سـەرخۆ؛ ئارام ‹حرکت بطیٔ: جووڵانەوەی هیور›.

**بطـــیٔ‌الاثــر** / batî'ol'asar /: [عربـی] صـفت. هێورکـــار؛ بـــە کارتێکـــەری هێـــواش و

مەودادارەوە.

**بطیءالانتقال** / batî'ol'enteqāl/: [عربی] *صفت*. دێرپاو؛ خاوەبیر؛ خاوەن تایبەتمەندی دێر تێگەیشتن.

**بطیءالهضم** / batî'ol'hazm/: [عربی] *صفت*. دێرهەڵتاو؛ دێردەن؛ بە گرفت؛ نەگڤێربار؛ قەبز؛ سەختەهەرس ‹گوشت قرمز و زردەی تخم‌مرغ بطیءالهضم هستند: گۆشتی سوور و زەردێنەی هێلکە دیر هەڵتاون›.

**بع بع** / ba'ba'/: *صوت*. بارە؛ باع؛ قارە؛ بارەبار؛ قارەقار؛ قالەقال؛ دەنگی بزن و مەڕ و ئاسک.

**بعث** / ba's/: [عربی]/*اسم*. *[ادبی]* هەستانەوە؛ راپەرین؛ راپەڕان؛ ئەوەخێزیەی؛ هەستانی هەموان لەو دونیادا؛ زیندوو بوونەوەی دوای مەرگ.

**بعثت** / be'sat/: [عربی]/*اسم*. *[ادبی]* کار یان ڕەوتی هەناردن؛ هەڵنان؛ راپەڕاندن؛ هۆرخێزنەی؛ هاندان ‹بعثت پیامبر اسلام: هەناردنی پێغەمبەری ئیسلام›.

**بعثه** / be'se/: [عربی]/*اسم*. ۱. ناردە؛ نێردە؛ دەسە؛ لێژنەی بەرێکراو بۆ فرمانێکی تایبەت ۲. /ـها/ ناردەکۆ؛ شوێنی گیرسانەوەی ئەو تاقمە.

**بعد**[1] / ba'd/: [عربی] *صفت*. دوایی؛ دمایی؛ دمەین؛ پاش ‹نفر بعد؛ شب بعد: کەسی دوایی؛ شەوی دوایی›.

**بعد**[2]: *قید*. لەودوا؛ لەوەو دوا؛ ئمجا؛ ئینجا؛ ئیگل؛ ئینگل؛ ئیکە؛ دوا؛ دما؛ دوما؛ پاش؛ لە پاش ‹دو سال بعد: دوو ساڵ لەودوا›.

◙ **بعدازظهر**: دوای نیوەڕۆ؛ پاش نیوەڕۆ؛ دوماپیشی؛ دمانیمەڕۆ؛ دوانیمەڕۆ؛ هەلاشانی؛ هەلایەری؛ دویانیمەڕوو؛ دوای سەعاتی ۱۲ هەتا دەمەو ئێوارە.

**بعد از میلاد**: پاش زایین؛ دوای زایین؛ پاش لە دایک بوونی عیسا مەسیح.

**بعد** / bo'd/، ـها؛ ابعاد /: [عربی]/*اسم*. ۱. دووری ۲. *[ریاضی]* لا؛ ڕەهەند؛ هەریەک لە تایبەتمەندیگەلی وێنەیەک کە پێشاندەری درێژی، تەسکی، بارست یان قووڵایی بێت ۳. بار؛ ڕوو ‹بعد هنری: باری هونەری›.

**بعداً** / ba'dan/: [عربی] *قید*. پاشی؛ لەدوای؛ دوڤکی؛ دوایی؛ دمایی؛ چیدما؛ چێوما؛ چیەولا؛ ئیکە؛ لە پاشان؛ لەمە پاش؛ لەمەودوا؛ لەمەولا؛ لەمەولاوە؛ هەمسا؛ هەماسکێ؛ دواخر.

**بعدها** / ba'dhā/: [عربی/ فارسی] *قید*. دواتر؛ دماتەر ‹بعدها می‌گفت آن روز خیلی ترسیده بود: دواتر ئەیگوت: ئەو ڕۆژە زۆر ترسا بوو›.

**بعدی**[1] / ba'dî/: [عربی] *صفت*. دوایی؛ دوایین؛ دمایین؛ دمەین؛ دیکە؛ کە ‹خانەی بعدی: ماڵی دوایین›.

**بعدی**[2] / ـها/: *ضمیر*. دواین؛ ئەوی کە؛ ئەویاکە؛ ئەوی تر؛ ئەوی‌دیکە؛ دمایین؛ دمەین ‹بعدی بیاید: ئەوی‌تر بێت›.

**ـبعدی** / bo'dî/: [عربی] *پیوازە*. ـپالوو؛ ـلایی ‹دوبعدی؛ چهاربعدی: دوولایی؛ چوارپالوو›.

**بعضاً** / ba'zan/: [عربی] *قید*. بە شێوەی بەشێک لە کۆمەڵێک: *الف)* بڕێک لە؛ بڕێ؛ هێندێ؛ بڕێو ‹سیبها بعضاً خراب بودند: هێندی لە سێوەکان خراپ بوون› *ب)* جاربەجار؛ جارەوجار؛ جاروبار ‹بعضاً او را می‌دیدم: جاروبار دەمدیت›.

**بعضی**[1] / ba'zî/: [عربی] *صفت*. هێندێ؛ هەندک؛ هەندۆ؛ هنەک؛ هێندیک؛ بڕێ؛ بڕێک؛ بڕێو؛ بازێ؛ بازێک؛ بەشێ؛ بەشێک یان هەندێکی ناڕوون لە گرۆیەک ‹بعضی آدمها این طورند: هێندی مرۆ ئاوەهان›.

**بعضی**[2] / ـها/: *ضمیر*. بڕێک؛ بڕێ؛ بڕێو؛ بەشێ ‹بعضی‌ها فرار کردند: بڕیک هەلاتن›.

**بعلاوه**[1] / be'alāve/: [فارسی/ عربی]/اسم. لە سەر؛ نیشانەیەک بەم بیچمە(+) کە نیشان دەدا ژمارەگەلی ئەملا و ئەولا دەخرێنە سەر یەک ‹دو بعلاوه چهار می‌شود شش: دوو لە سەر چوار دەکاتە شەش(٦=٤+٢)›.

**بعلاوه**[2]: قید. جگە لەوە؛ جیا لەوە؛ سەرەڕای ئەوە؛ جگەیم ئینەیچە؛ تازە؛ سەرباقی ئەوە ‹بعلاوه انگلیسی هم می‌داند: جگە لەوە ئینگلیسیش دەزانێ›.

**بعله** / ba'le/: [از عربی] ☜ **بَلی**

**بعله‌برون** / ba'leborûn/: [از عربی/ فارسی] ☜ **بَله‌بُران**

**بعید** / ba'îd/: [عربی] صفت. دوور: ١. نەگونجاو؛ نەشیاو؛ نەکرا؛ نەکریاگ؛ نەبووگ ‹دروغ از تو بعید است: درۆ لە تۆ دوورە› ٢. [ادبی] دیر؛ بە مەودایەکی زۆرەوە ‹نشانه در جای بعیدی بود: نیشانەکە لە شوێنێکی دوورەوە بوو›.

**بعینه** / be'ayne(h)/: [عربی] قید. هەروا؛ هەر وەک خۆی؛ ڕاست بەو دەقە؛ هەر وەک؛ ڕێک وەک خۆی؛ هەر پێسەو.

**بغ** / boq/: [؟] ☜ **بُق**

**بغاز** / boqāz، ـها/: [ترکی]/اسم. [قدیمی] خڕتەنگ؛ دڕگە؛ تەنگاو؛ تەنگاقی؛ دەربەند؛ ئاقتەنگ؛ گەلی؛ ناقبرک؛ دەرتەنگ؛ تەنگە؛ بەحمە؛ تەنگڵە؛ باریکە ئاوێک کە دوو وشکی لێک جیا دەکاتەوە.

**بغایت** / beqāyat/: [عربی] قید. [ادبی] یەکجار؛ زۆر زۆر؛ ئێجگار زۆر؛ فرەفرە؛ گەلەک؛ پڕ؛ تەواو؛ تەمام؛ لەوپەڕی زۆریەوە ‹هوا بغایت سرد بود: هەوا یەکجار سارد بوو›.

**بغتتاً** / baqtatan/: [عربی] قید. [ادبی] لەناکاو؛ کوتوپڕ؛ لەپڕ؛ گز؛ گوزوگومەت ‹بغتتاً از جایی صدای تیر بلند شد: لەپڕ لە شوێنێکەوە دەنگی گولە بەرز بۆوە›.

**بغرنج** / boqranc/: صفت. دژوار؛ سەخڵەت؛ تووش؛ سەخت؛ ئاریشە؛ ناڕەحەت؛ ئاستەم؛ گران؛ ئاڵۆز؛ پێچراو؛ هەڵپێچراو؛ پێچیاگ ‹کار بغرنج: کاری دژوار›.

**بغرنجی** / boqrancî، ـها/: اسم. سەخڵەتی؛ دژواری؛ ئاریشەیی؛ تووشی؛ سەختی؛ ناڕەحەتی؛ ئاستەمی؛ گرانی؛ هەڵپێچراوی؛ پێچیاگی.

**بغض** / boqz/: [عربی]/اسم. ١. [ادبی] ڕق؛ ڕک؛ قین؛ دوژمنی؛ قینی؛ ڕکە؛ هەیف ٢. ئۆناق؛ حرس؛ ناق؛ ئەنگرۆوی؛ ئراز ‹از شدت بغض صدایش در نمی‌آمد: لەتاو ئوناقدا، دەنگی دەرنەدەهات›.

▣ **بغض کردن**: ئۆناق‌کردن؛ ناق‌کردن؛ گیرانی گەروو بە هۆی خەم یان ڕقەوە.

**بغض کسی ترکیدن**: ناق بەر بوون؛ ئۆناق بەر بوون؛ ڕس بەر بوون؛ بە دەنگی بەرز کەوتنە گریانەوە.

**بغض گلوی کسی را گرفتن**: ناق قوڕی کەسێ گرتن؛ ئۆناق گەرووی کەسێک گرتن.

**بغل** / baqal/: اسم. [گفتاری] ١. ئامێز؛ هەمبێز؛ باوەش؛ واشی؛ هاوش ‹او را در بغل گرفت: گرتیە باوەشەوە› ٢. پاڵ؛ پەنا؛ لا؛ تەنیشت ‹در بغل اطاق من چند اطاق دیگر بود: لە پاڵ ژوورەکەمەوە چەن ژووری‌تر هەبوون› ٣. باوەش؛ واشی؛ پڕباوەش ‹یک بغل کتاب: باوەشێ کتێب› ٤. پاشۆڵ؛ پاخل؛ باخەڵ؛ پاشڵ؛ بەخەڵ؛ باغەڵ؛ پاخەڵ؛ چنگڵ؛ هەنگڵ؛ هەنگڵێ؛ کەس؛ کەش؛ تەنشتی مرۆ؛ بەشی ژێر باڵی مرۆ هەتا خوارەوە.

▣ **زیر بغل** ☜ **زیر**[3]

▣ **بغل زدن** ☜ زیر بغل زدن، **زیر**[3]

**بغل کردن**: لە ئامێزگرتن؛ باوەش‌کردن؛ گرتنە باوەش؛ گردنە باوشەو؛ گێرتەی

واشی.

**بغل** / baqale/: حرف. *[گفتاری]* پاڵ؛ کن؛ تەنیشت؛ لا ‹بغل دیوار: پاڵ دیوار›.

**بغلبند** / baqalband، ـها/: اسم. *[معماری]* هەنگلەوانە؛ پاڵ گیر؛ پاڵ بەست؛ پاڵ بەند؛ پێکهاتەیەکی پتەو لە بەرامبەری گوشاری دەور و بەر و سەرەوە کە لە تاق یان پردێکدا پێک دێ.

**بغل خوابی** / baqalxābî، ـها/: اسم. *[گفتاری]* هاوباوەشی؛ هام‌ئامێزی؛ لە بەخەڵی یەکتردا خەوتن.

**بغل دست** / baqaldast، ـها/: قید. *[گفتاری]* پاڵ‌دەست؛ لادەست؛ بەخەڵ‌دەس؛ لا تەنیشت ‹بغل دست راننده نشستم: لە پاڵ‌دەستی شۆفیرەوە دانیشتم›.

**بغل دستی**[1] / baqaldastî/: صفت. لادەستی؛ پاڵ‌دەسی؛ بەخەڵ‌دەسی ‹صندلی بغل‌دستی: کورسی پاڵ‌دەستی›.

**بغل دستی**[2] / ـها/: ضمیر. لادەستی؛ پاڵ‌دەسی؛ بەخەڵ‌دەستی ‹بغل‌دستیم خیلی حرف می‌زد: لادەستیەکەم زۆری قسە دەکرد›.

**بغلی**[1] / baqalî، ـها/: اسم. کەمۆڵە؛ گۆگم؛ دەفرێکی شووشەیی کە لێوارێکی باریکی هەیە.

**بغلی**[2]: صفت. *[گفتاری]* باوەشی؛ بە نیاز بۆ باوەش گرتن ‹بچه بغلی: منالی باوەشی› ۲. باخەڵی؛ گیرفانی ‹ساعت بغلی: سەعاتی باخەڵی› ۳. پاڵ؛ پاڵ‌دەست؛ لادەست؛ تەنیشت؛ بەخەڵدەست ‹خانه‌ی بغلی: ماڵی لە پاڵ‌دەست›.

**بغلی**[3] / ـها/: ضمیر. لادەست؛ پاڵ‌دەست؛ بەخەڵ‌دەست؛ کەسێ کە کەوتۆتە تەنیشت یەکێ‌ترەوە.

**بق** / boq/: [؟]/اسم. درژی؛ گرژی؛ داگیراوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی درنج بوونی نێوچاوان و بۆران کردنیان بە هۆی ناڕاحەتیەوە ‹از صبح بق کرده: لە بەیانیەوە درژی کردووە›: بُغ. هەروەها: **بق کردن**

**بقا** / baqā/: [عربی]/اسم. ڕەوتی مانەوە؛ مان؛ ئەوەمەنەی؛ مەنایوە.

◙ **بقای اصلح**: *[زیست‌شناسی]* مانەوەی باشترین؛ مانەوەی چاکترین؛ ئەو دانستەیە کە دەڵێ: لە سروشتدا ئەوانە بڕ دەکەن و دەمێننەوە، وا باشتر لەگەڵ ئاقار و دیاردەگەلی جۆراوجۆری دەوربەریاندا ڕاهاتوون: **بَقای أنسب**

**بقای انرژی**: *[فیزیک]* مانەوەی هێز؛ هێز لە هیچەوە دروست نابێ و ناشفەوتێ.

**بقای انسب** ☜ **بقای‌اصلح**

**بقای جرم**: *[فیزیک]* مانەوەی ماک؛ ماک لە هیچەوە دروست نابێ و ناشفەوتێ.

**بقای جرم و انرژی**: *[فیزیک]* مانەوەی هێز و ماک؛ هێز و ماک جێ‌گۆڕکێ دەکەن، بەڵام سەرجەمیان کەم و زیاد ناکا.

**بقاع** / 'beqā/: [عربی] جمعِ ☜ **بُقعه**

**بقاعده** / beqā'ede/: [عربی] قید. ڕێک‌وپێک؛ بە ڕست؛ بە بنەما.

**بقال** / baqqāl، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. بەقاڵ؛ دووکانداری ئازووخەفرۆش.

**بقالی** / baqqālî، ـها/: [عربی]/اسم. بەقاڵی؛ ئازووخەفرۆشی.

**بقایا** / baqāyā/: [عربی] جمعِ ☜ **بقیّه**

**بقچه** / boqče، ـها/: [ترکی]/اسم. پریزە؛ پریاسکە؛ پرێسکە؛ تۆشەبەرە؛ بوخچە؛ بخچە؛ پارچەیێکی چوارگۆشە بۆ کەل‌وپەل تێنان.

◙ **بقچه کردن**: پێچانەوە؛ پریاسکە پێچاندنەوە؛ لە بوخچە خستن.

**بقچه‌پیچ** / boqčepîč، ـها/: [ترکی/ فارسی] صفت. پریزەپێچ؛ بوخچەپێچ؛ پێچراوە.

**بقعه** / boq'e، ـها؛ بِقاع/: [عربی]/اسم. گومبەز؛ گومەت؛ گومبەت؛ گومەز و بارەگا ‹بقعەی پیرشالیار: گومبەزی پیرشالیار›.

**بقول** / boqûl، ـات/: [عربی]/اسم. هیش؛ دانەوێڵە؛ وشکەدان؛ وردەدان؛ دڕکەدۆ؛ نیسک و نۆک.

**بقه** / boqqe/: [؟]/اسم. بۆققە؛ گەورەترین ئاسکی ئەفریقی کە بەرزی نێرینەکەی نێزیک بە ٢ میتر دەبێ و قورسایی بە ٥٠٠ کیلۆگرەم دەگا و شاخەکانیشی پێچەڵپێچ هەڵکشاوە.

**بقیه**[1] / baqîyye/: [عربی]/اسم. پاشماوە؛ ماوە؛ باقیماو لە شتێک؛ ئەوە مەنە؛ درێژەی شتێ؛ بەشێ لە کۆمەڵەیێک کە بە شوێن پاژی پێشەوە دێ.

**بقیه**[2]: صفت. لێماو؛ چنەمەنە: ١. پاشماوە؛ نەشەمیراو ‹بقیەی کار: لیماوی کار› ٢. باقی؛ ئەوامەنە؛ دەکارنەکراو ‹بقیەی نان: لیماوی نان›.

**بقیه**[3] / ـها؛ بقایا/: [عربی] ضمیر. لێماوە؛ چنەمەنە؛ باقی؛ هەندێک لە کۆمەڵێ کە دوای کار یان ڕووداوێک دەمێنێتەوە.

**بقیه‌السیف** / baqîyyatossayf/: [عربی] صفت. باقی لەشکر، یان خەڵکێکی تێکشکاو کە لە مەرگ دەربازییان بووە.

**بقیه‌الله** / baqîyyatollāh/: [عربی]/اسم. [شیعه] نازناوی ئیمام مەهدی، ئیمامی دوازدەهەمی شیعەی دوازدە ئیمامی.

**بکار** / bekār/: صفت. [گفتاری] بەگەڕ؛ وەگەڕ؛ لە کار؛ خەریک؛ سەرقاڵ؛ خەریک بە کار ‹آسیابش بکار است: ئاشەکەی بەگەڕە›.

**بکارت** / bekārat/: [عربی]/اسم. ١. بن؛ بنە؛ کچێنی؛ کەنیشکی؛ کناچەیی؛ ئازەوی ٢. [کنایی] تازەیی؛ دەژی؛ تاسۆخی؛ دەستلێنەدراوی؛ دەسنەخواردوویی.

**بکر** / bekr/: [عربی] صفت. ١. باکرە؛ بەکچێنی ‹دختر بکر: کچی بەکچێنی› ٢. دەس‌لێنەدراو؛ دەژ؛ مۆر؛ تازە؛ نفت‌ونۆڵ؛ کار پێنەکراو ‹زمین بکر: زەوی دەس‌لێنەدراو› ٣. [کنایی] تەڕ و تازە؛ نوێ ‹فکر بکر: بیری دەژ›.

**بکرات** / bekarrāt/: [عربی] ☜ **بەکَرات**

**بکس** / boks/: [فرانسوی از انگلیسی]/اسم. ١. گومەلە؛ گوڵەمە؛ مست؛ مشت؛ مشتەکۆڵە؛ مستەکۆڵە؛ گوڵم؛ گوڕمیچ؛ گوڕمچە؛ گورمێچە ٢. [ورزش] بۆکس؛ مستەکۆڵان؛ مشتەکۆڵانی * **بۆکس**

**بکسل** / boksel/: [روسی از هلندی]/اسم. بۆکسێل؛ کشان؛ کێشان؛ کار و ڕەوتی کێشانی ماشینێکی لەکارکەوتوو بە ماشینێکی‌تر. هەروەها: **بکسل کردن**

**بکسوات** / boksovāt/: [روسی از آلمانی]/اسم. بوکسەوات؛ خولانەوەی چەرخی ماشین لە جێی خۆیدا، لە بەر لووسی زەوی و ساف‌بوونی لاستیک.

**بکسور** / boksor، ـها/: [فرانسوی از انگلیسی] اسم. گۆڵەمەباز؛ گومەلەباز؛ مشت‌وەشێن: **بۆکسور**

**بکش** / bokoš, bekoš/: قید. بەتاو؛ پڕتاو؛ بە هەموو هێزەوە؛ لەو پەڕی توانایید ‹یک سال بکش کار کرد: ساڵێک بەتاو کاری کرد›.

**بکش‌ـ‌بکش** / bokošbokoš, bekošbekoš، ـها/: اسم. [گفتاری] قەڵت‌وبڕ؛ کوشت‌وبڕ؛ کوشت‌وکوشتار.

**بکلی** / bekollî/: [فارسی/عربی] قید. تێکڕا؛ یەکسەرە؛ یەکسەر؛ یەکجێ؛ یەکجاری؛ دەراندەر؛ پاک؛ بەتەواوی؛ یەکەشە.

**بکن** / bekan/: صفت. [گفتاری] تێخ‌وەشێن؛ کێرگ‌وەشێن؛ گوێبڕ.

**بکن** / bekon, bokon/: صفت. [گفتاری]

کارکەر؛ بکەر ‹او کار بکن نیست؛ اگر بکن بود تا حالا ده کار پیدا می‌کرد: کارکەر نیە؛ ئەگەر کارکەر بوایە، تا ئێستا دە کاری دۆزیبووەوە›.

**بکوب** / bekûb/: *قید. [گفتاری]* بەپەلە؛ بەگورجی؛ بەهەشتاو؛ بەهەڵە؛ بەتاو؛ بەگۆژمە؛ بەهەڕەمە؛ بەلەز؛ بە هەڵپە؛ بە تیزە؛ بە هەلات؛ بە دەواڵ؛ پەلەپەل؛ لەزبەلەز؛ هەڵەداوان؛ پەلەپاتۆر؛ ڕەمەڕەمالێ؛ هەلات‌ـهەلات؛ بریو‌ـبریو؛ بەل‌ـبەل؛ هەڵپە‌ـهەڵپە ‹بکوب رفتم سر کوچه: بە پەلە چوومە سەری کۆڵان›.

**بگو** / begû/: *حرف. [گفتاری]* بەڵێ؛ بێژە؛ واچە؛ بگێ؛ وێژە؛ بووشە؛ بوویش؛ ببێ؛ ببێژە: ١. وشەیەکە لە سەرەتای ڕستەی پرسیاریەوە دێ و نیشانەی دەرخستنی هۆی کارێکە ‹بگو چرا نیامدی؟ رفته بودی مسافرت؟: بلێ بۆ نەهاتی؟ سەفەر چووبووی؟›
٢. تۆ خوا؛ ڕاستی؛ وشەیەک بۆ نیشاندانی داخ یا لۆمە کردن ‹بگو این شد رسم دوستی؟: تو خوا شەرتی دۆستایەتی ئەمە بوو؟›.

**بگوبخند**[1] / begûbexand، ـها/: *اسم. [گفتاری]* قلەقل؛ قلە و هۆڕە؛ گۆنگل؛ گۆنگەر؛ وت‌ووێژی بە شۆخی و پێکەنین ‹شوخی و بگوبخند هم حدی دارد: گاڵتە و قلەقلیش تا ڕادەیەک خۆشە›.

**بگوبخند**[2] /ـها/: *صفت. [گفتاری]* خەنەران؛ خەنۆڵ؛ خەندەران ‹آزاد آدم بگوبخندی است: ئازاد مرۆڤێکی خەندەرانە›.

**بگو ـ مگو** / begûmagû، ـها/: *اسم. [گفتاری]* دەمەقرە؛ چەقەچەق؛ دەمەقاڵە؛ دەمەدەمێ؛ قرەقر؛ چەقە و گوڕە؛ قرینە؛ جەنگەمرینگێ؛ جەنگ وهەرەمەزات؛ کێشە و هەرا؛ چێقەچێق؛ مشت و مڕ؛ گێرە و کێشە؛ وت‌ووێژی بە ئاژاولەوە ‹باز دیشب صدای بگو‌مگوی شما می‌آمد: دوێشەو دیسانەوە دەنگی دەمەقرەی ئێوە دەهات›.

**بگونیا** / begon(i)yā/: [فرانسوی] *اسم.* گوڵەهەزار؛ گوڵەپەژیوان؛ تیرەیێک گیای ناوچەگەلی گەرمێنە.

**بگیر** / begîr/: *صفت. [گفتاری]* بگر؛ بۆگرتن؛ بۆ سەندن؛ خاوەن ئۆگرەتی و ڕاهاتوو بەگرتن ‹او فقط دست بگیر دارد: تەنیا دەستی بگری هەیە›.

**بگیر ـ بگیر** / begîrbegîr/: *اسم.* بگرە‌ـبگرە؛ بگرە و بەردە؛ ڕەش‌بگیر؛ کار یان ڕەوتی قۆڵبەستکردنی بەشێکی زۆر لە خەڵک ‹فردای آن روز بگیر‌ـ بگیر شروع شد: بەیانیەکەی ڕەش‌بگیر دەستی پێکرد›: **بگیر و ببند**

**بگیر و ببند** / begîr-o-beband/ ☜ **بگیر‌ـ بگیر**

**بل** / bal/: [عربی] *حرف. [ادبی]* بەڵکوو؛ بەلکە؛ بەڵکەم؛ بەشکەم ‹بل این هزار دلیل است، بل هزار هزار: لە مەدا هەزار هۆیە، بەڵکوو هەزار هەزار›.

**بل** / bol/: *اسم. [گفتاری]* قۆستنەوە؛ قۆزتنەوە: ١. کار یان ڕەوتی لە هەوا گرتنەوەی شتێک بەر لەوەی بکەوێتە زەوەی ٢. هەڵزانین؛ دەرفەت ناسینەوە ‹زود از حرف من بل گرفت و گفت پس می‌توانی قدری به من قرض بدهی: گورج قسەکەمی قۆستەوە و گوتی کەوایە دەتوانی نەختێکم قەرز بدەیتێ›.

**بلا**[1] / balā، ـها/: [عربی] *اسم.* چۆرتم؛ چەترمە؛ چەل؛ قەترمە؛ لەترمە؛ وەیشووم؛ وەیشوومە؛ قەزا؛ نەقازە؛ قۆرت؛ قسپ؛ بەڵا؛ گرگاشە؛ تەرن؛ نسیبەت؛ بڵێشە؛ دومات؛ هەر جۆرە بەسەرهاتی ناخۆش و زیان‌دەر (وەک نەخۆشین، شەڕ، ئیشکەساڵی، بوومەلەرزە و...).

▣ بلا آمدن/ رسیدن: بەڵا بە سەردا هاتن؛ چۆرتم بە سەرا هاتن.

بلا بر سر کسی آوردن: بەڵا بە سەر

کەسێکدا هێنان؛ کەسێ تووشی چۆرتم کردن.

بلا دیدن: بەلا دیتن؛ چەلومل بە سەر هاتن؛ چۆرتم دیتن؛ گیرۆدەی بەلا بوون.

**بلا**[2]: *صفت.[کنایی]* دیڤۆک؛ قۆشمە؛ چەلاق؛ بەلا؛ بزۆز؛ بزێو؛ پێچ.

**بلا** / belā/: [عربی] *پیشوند.* بێ ـ ؛ بەبێ ـ ‹بلافاصله: بێوچان›.

**بلااثر** / belā'asar/: [عربی] *صفت.* بێ کەلک؛ ناکارامە؛ بێ کارتێکەری ‹تلاش ما بلااثر بود: پەلوپۆمان بێ کەلک بوو›.

**بلااستثنا** / belā'estesnā/: [عربی] *قید.* تێکڕا؛ گرداوگرد؛ پڕبەپڕ؛ سافلەساف؛ بێ بواردن؛ بێ جیاکردنەوە یان هەڵاواردنی یەکێ لەو کۆمەڵە کە باسی لێوە دەکرێ.

**بلااستفاده** / belā'estefāde/: [عربی] *صفت.* بێ کەلک؛ بێ فایە ‹نگذار پولت بلااستفاده بماند: مەهێڵە پارەکەت بێ کەلک داکەوێ›.

**بلاتأخیر** / belāta'xîr/: [عربی] *قید.[نامتداول]* بێدرەنگ؛ دەسبەجێ؛ ڕێوڕا؛ دەردەم؛ دەرلاد؛ گورج؛ دەمودەس؛ دەستوبرد: **بلادرنگ**

**بلاتردید** / belātardîd/: [عربی] *قید.* بێ شک؛ بێ گومان؛ بێ دڕدۆنگی ‹بلاتردید خواهد آمد: بێ شک دێ›.

**بلاتشبیه** / belātašbîh/: [عربی] *قید.* بیلاتەزبی؛ بیلاتەژی؛ بیلامانێ ‹بلاتشبیه مثل میت افتاده بود: بیلاتەزبی وەکوو مردوو داکەوتبوو›.

**بلاتکلیف** / belātaklîf، ـها/: [عربی] *صفت.* دەستەئەژنۆ؛ دەسەزرانی؛ دەسەپاچە؛ دەستەپاچە؛ خاوەن داهاتوو، کار یان ئەرکێکی ناڕوون و نادیار.

**بلاتکلیفی** / belātaklîfî، ـها/: [عربی] *اسم.* دەستەئەژنۆیی؛ دەسەزرانی؛ دەسەپاچەیی؛ دەستەپاچەیی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی دیار نەبوونی کار یان ئەرک و چارەنووسی کەسێک.

**بلاخیز** / balāxîz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بەلابار؛ چەلوملدار ‹کشور بلاخیز: ولاتی بەلابار›.

**بلاد** / belād/: [عربی] *اسم.[ادبی]* شاران؛ شارگەل؛ شارێ ‹بلاد روم: شارانی ڕۆم›.

**بلادر** / balādor، ـها/: [هندی] *اسم.* گوڵ شەیتان؛ گوڵ شەیتانە؛ قورسی کەمەر؛ بنچکێکە لە تیرەی سماقیان، گەڵای هێلکەیی، گوڵی کۆیی و میوەی ڕەشی هێلکەیی هەیە: **بلاذر**

▣ بلادر آمریکایی ☜ **آکاژو**

بلادر مغربی ☜ **آکاژو**

**بلادرنگ** / belāderang/: [عربی/ فارسی] *قید.* ژپێلقە؛ بێ خۆگرتن؛ بێدرەنگ کردن؛ دەمودەس؛ دەسبەجێ؛ دەس‌وبرد: **بلاتأخیر**

**بلادن** / bellādon/: [لاتینی] ☜ **شابیزک**

**بلادیده** / balādîde، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بەلادیتوو؛ چەلومل بە سەر هاتوو؛ چۆرتم لێهاتوو؛ گیرۆدە لە نێوان بەلا و ڕووداوی ناخۆشدا ‹مردم بلادیده: خەڵکی بەلادیتوو›: **بلازده**

**بلاذر** / balāzor/: [هندی] ☜ **بلادر**

**بلازده** / balāzade/: [عربی/ فارسی] ☜ **بلادیده**

**بلاصاحب** / belāsāhab, -sāheb/: [عربی] *صفت.* بێ خاوەن؛ بێ خێو؛ بێ وە؛ بێ خودان؛ بێ ساحێو.

**بلاعقب** / belā'aqeb/: [عربی] *صفت.* وجاخ کوێر؛ ئوجاخ کوێر؛ بێ منداڵ.

**بلاعوض**[1] / belā'avaz/: [عربی] *صفت.* خۆڕایی؛ مفتە؛ بێ پارە؛ مشە؛ بێ باربوو ‹کمکهای بلاعوض مردم: یارمەتیگەلی خۆڕایی

خەلک›.

**بلاعوض**: *قید.* مفتەکی؛ بەخۆڕایی؛ بەمفتە؛ بەمشە ‹خانە را بلاعوض در اختیارم گذاشت: ماڵەکەی بە خۆڕایی دایە دەستم›.

**بلاغت** / balāqat, belāqat/: [عربی] *اسم.* ڕەوانبێژی؛ دەمپاراوی؛ وتەپاراوی؛ زمانداری؛ دۆخ یان چۆنیەتی وتە دەربڕین بە شێوەیەکی شیاو و لە باو و دڵخواز، بە پێی ڕست و بنەمای وێژەیی.

**بلافاصله** / belāfāsele/: [عربی] *قید.* دەسبەجێ؛ زوو؛ دەردەم؛ خرپ؛ گورج؛ ئازا؛ تاقل؛ خڕانە؛ خەیرا؛ دەس‌وبرد؛ بێ‌وچان؛ دەمودەس؛ بێ سێ‌ودوو؛ گەرماوگەرم؛ زووبەزوو؛ جێ‌قەرجێ؛ بە زووترین کات ‹بلافاصله پول را داد: دەسبەجێ پارەکەی دا›.

**بلافصل** / belāfasl/: [عربی] *صفت.* نەپساو؛ لێ‌نەبڕاو؛ پێوەلکاو؛ پێوەست؛ لێک نەپساو؛ بێ‌نێوبڕ.

**بلاکش** / balākeš، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* چەلوملبار؛ بلێشەکێش؛ مەینەت‌کێش؛ بەلاگەردان؛ بەلاکێش؛ بەلاگێڕ ‹عاشقی شیوەی رندان بلاکش باشد: بەندەواری واز و ڕێبازی چەلوملبارە›.

**بلاکشیده** / balākešîde، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* مەینەت‌دیتوو؛ دۆمات‌دیتوو.

**بلاگردان** / balāgardān، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ۱. قەزاگێڕەوە؛ بەلاگێڕ؛ بەلاگەردان؛ هۆ و هۆکاری بەلا و مەینەت دوورکەرەوە (وەک سەدەقە و ئیحسان) ۲. قەزاگەر؛ قوربان؛ فیدا؛ سەرگەرد؛ وەی‌وەگەڕێن؛ بەلاگەردان؛ کەسێ کە خۆی تووشی بەلا کات، بۆ ئاسایشی کەس یان کەسانی‌تر.

**بلال** / balāl، ـها/: *اسم.* گەنمەشامی؛ گەرمەشانی؛ گوڵەپێغەمبەرە؛ سەرگەشیرە؛ لازوویت؛ شیرەبەلال؛ بەری گیای زوڕات کە بە تەڕی نرابێتە سەر ئاور و وەک چەرەز دەخورێ.

**بلامانع** / belāmāne'/: [عربی] *صفت.* بێ‌پەرکەم؛ بێ‌لەمپەر؛ بێ‌تەگەرە؛ بێ‌گەپل؛ بێ‌کۆسپ و بەرهەڵست؛ ئازاد ‹قدم زدن بلامانع است: پیاسەکردن بێ‌پەرکەمە›.

**بلامعارض** / belāmo'ārez/: [عربی] *صفت.* بێ‌بەرهەڵست؛ دژبەر؛ بێ‌سەرپێچکار؛ بێ‌گێچەڵ.

**بلامنازع** / belāmonāze'/: [عربی] *صفت.* بێ‌دوژمن؛ بێ‌دژمەن؛ نانەیار.

**بلانسبت** / balānesbat/: [عربی] *قید.* گوڵ لە بەینا بێ؛ بیلاتەشبێ؛ بیلاتەشبی؛ پەرژینی بە گوڵ بێ؛ بەلا نسفەت؛ بەلا نسبەت؛ بیلامانێ؛ پەرچینێوی قەیم بۆ ‹بلانسبت شما، گاو از او بیشتر می‌فهمد: گوڵ لە بەینا بێ، گا لەو باشتر دەزانێ›.

**بلاهت** / balāhat, belāhat، ـها/: [عربی] *اسم.* [ادبی] گەوجی؛ گەمژەیی؛ گەمژەڵی؛ دەبەنگی؛ گێلی؛ گێژی؛ نەزانی؛ نەفامی ‹می‌گویند ریش دراز نشانەی بلاهت است: دەڵێن ریشی درێژ نیشانەی گەوجیە›.

**بلایا** / balāyā/: [عربی] جمعِ ☜ **بلیّه**

**بلبشو** [1] / belbešû, balbešû/: *اسم.* [گفتاری] بشێوە؛ ئاژاوە؛ ئاژاولە؛ ئاژاولێ؛ گێرە؛ گۆتاوەڕۆ؛ پەشێوێنی؛ گاشە؛ کێشە و هەرا ‹ببین چە بلبشویی راە انداختەای!: بڕوا چ ئاژاودیەکت ناوەتەوە!›.

**بلبشو** [2]: *صفت.* شێواو؛ شێویاگ؛ پەشێو؛ بشێو؛ چەنگ؛ تێکەولێکە؛ بێ‌سەرە و بەرە؛ کەس‌لەکەس ‹خانە بلبشو شدە است: ماڵەکە شێواوە›.

**بلبل** / bolbol، ـها؛ ـان/: *اسم.* سەرخوونک؛ بولبوول؛ بلبل؛ بولبول؛ بڵبڵ؛ واف؛

پەلەوەری دەنگ خۆشی ستران‌بێژ.

**بلبل‌زبانی** / bolbolzabānî، ـها/: /اسم. ۱. [مجازی] دەم‌پاراوی؛ زارشیرینی؛ گفت‌ولفت رەوانی ۲. [تعریض] وراجی؛ زۆربێژی؛ فرەوێژی.

**بلبله** / bolbole، ـها/: [عربی از فارسی ؟]/اسم. گۆزەڵە؛ گۆزەڵێ؛ گۆزەی بچووکی لوولەدار.

**بلد**[1] / balad، ـها/: [عربی]/اسم. شارەزا؛ گەزەک؛ ڕێزان؛ ڕێنوێن؛ ڕێنوما؛ بەڵەد؛ بەڵەو؛ بەڵەڵ؛ ڕێشاندەر؛ کەسێ کە مسافر یان ناشارەزایەک هاوڕێیی دەکا و ڕێگای پیشان دەدا ‹یک بلد راه را نشانمان داد: شارەزایەک ڕێگای نیشانداین›.

**بلد**[2]: صفت. شارەزا؛ گەزەک؛ بەڵەو؛ زانا؛ ئاگا؛ هاگا؛ کارامە؛ تێگەیشتوو ‹انگلیسی بلد نیست: شارەزای ئینگلیسی نیە›.

⊡ **بلد بودن**: بەڵەد بوون؛ شارەزا بوون؛ هلانین؛ زانین؛ زانا بوون؛ تێگەیشتوو بوون.

**بلد شدن**: فێر بوون؛ ڕاهاتن؛ هەڤۆتن؛ هین بوون؛ شارەزا بوون.

**بلدرچین** / belderčîn، ـها/: [ترکی]/اسم. سەمانەک؛ هەوێردە؛ هەویلە؛ کەڕەواڵە؛ کەڕۆڵە؛کەڕەوان؛ کەڕەوانە؛ کەرەوەرە؛ کاراک؛ کەراکە؛ مرەکەرە؛ بەتەک؛ سەمانەک؛ ئیلەگێشە؛ قارووتک؛ قورقۆک؛ کوڵەفڕ؛ هەڤردە؛ باڵندەیەکە دەنگی بەرز، دەنووکی کورت و ئەستوور، باڵی خڕت و پای بەهێزە: **بَدبَده؛ کَرک**

**بلدی**[1] / baladî/: [عربی]/اسم. [گفتاری] شارەزایی؛ گەزەکی؛ بەڵەیی؛ بەڵەلی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ئاگادار بوون: **بلدیت**

⊡ **بلدی خواستن**: [گفتاری] شارەزایی ویستن ‹غذای خوب پختن بلدی می‌خواهد: چێشتی چاک لێنان شارەزایی دەوێ›.

**بلدی**[2]: صفت. [ادبی] ۱. شاری؛ شارسانی؛ بازێڕی؛ پەیوەندیدار بە شارەوە ۲. شارەداری؛ پێوەندیدار بە شارەداریەوە.

**بلدیت** / baladîyyat/: [عربی] ☜ **بَلَدی**[1]

**بلدیه** / baladîyye/: [عربی]/اسم. [قدیمی] شارەداری.

**بلسان** / balsān/: [معرب از یونانی]/اسم. شینۆکە؛ دارشینکە؛ دارچکێکی دڕکاویە کەتیرەی لێ دەگرن.

**بلسکی** / balaskî/: [؟]/اسم. علف شیر ☜ **علف**

**بلشویسم** / bolševîsm, bolšovîsm/: [فرانسوی از روسی]/اسم. بولشویزم؛ بیر و ڕای مارکسی ـ لنینی کە زیاتر لە ۷۰ ساڵ لە ڕووسیەدا باو بوو: **بالشویسم؛ بُولشویسم**

**بلشویک** / bolševîk, bolšovîk، ـها؛ ـان/: [روسی] صفت. بولشویک: ۱. سەر بە بولشویزم ۲. ئەندامی حیزبی کومونیستی ڕووسیە ✻ **بالشویک؛ بُولشویک**

**بلع** / bal'/: [عربی]/اسم. [ادبی] لەف؛ قووت؛ قوویت؛ قورت؛ قووق؛ قوریتک؛ گەپ؛ هلیف؛ سل؛ حەپ؛ لەپان؛ کار یان ڕەوتی خواردەمەنی لە گەروو دانەخوار.

**بلعجب** / bol'acab/: [عربی] صفت. [ادبی] نامەخوا؛ ئەیەڕۆ؛ وشەیەک لە سەرسووڕماندا دەگوترێ: **بُوالعجب**

**بلعیدن** / bal'îdan/: [عربی/ فارسی] مصدر. متعدی.// **بلعیدی**: لرفاندت؛ **می‌بلعی**: دەلرفێنی؛ **ببلع**: بلرفێنە// لرفاندن؛ قووت دان؛ قویت دان؛ قورچاندن؛ قورتاندن؛ داقورتاندن؛ داپەچنین؛ هلوفانن؛ دابەلاندن؛ لەپاندن؛ سول‌داین؛ هشاقتن؛ هەڵمەقووت‌کردن؛ لەپنەی؛ هاپنەی؛ لە گەروو ناردنە خوار. هەروەها: **بلعیدنی**

■ صفت فاعلی: **بلعنده** (لرفێنەر)/ صفت مفعولی: **بلعیده** (لرفێنراو)/ مصدر منفی:

نَبلعیدن (نەلرفاندن)

**بلغا** / bolaqā/: [عربی]/اسم. /ادبی/ قسەزانان؛ قسەجوانان؛ گفتخۆشان؛ دەمپاراوان؛ ڕەوانبێژان؛ زارخۆشان.

**بلغار** / bolqār/: [ترکی از لاتینی]/اسم. بولغار: ۱. /ـها؛ ـان/ خەلکی ولاتی بولغارستان ۲. خێڵێک لە بنەچەی ئیسلاوە باشووریەکان، دانیشتووی بولغارستان ۳. پاژێک لە تورکانی هەڵنراو بەرەو ولاتی ڕووسیە.

**بلغاری**[1] / bolqārî/: [ترکی]/اسم. بولغاری؛ لە زمانە ئیسلاویەکان.

**بلغاری**[2] / ـها؛ ـان/: [ترکی] صفت. بولغاری؛ سەربە خێڵ یان ولاتی بولغارستان.

**بلغم** / balqam/: [معرب از یونانی]/اسم. /پزشکی/ بەلغەم؛ بلخەم: ۱. خرێن؛ بەلخەم؛ ڕیمی خەستەوەبووی بن کەپۆ کە زۆربەی لە دەمەوە تف دەکرێتەوە ۲. یەک لە چوار خلتی سەرەکی لەش، بە پێی بژیشکی کۆنەوە.

**بلغمی‌مزاج** / balqamîmezāc, -mazāc، ـها؛ ـان/: [معرب/ عربی] صفت. /کنایی/ سارد و سڕ؛ دێرئاخێز؛ تەپ؛ تەپلمۆس؛ تەپلۆس؛ لەشگران؛ مرۆی لەشقورسی مڕومۆچ.

**بلغور** / balqûr، ـها/: اسم. پەتلە؛ ساوار؛ ساوەر؛ ساور؛ ساقار؛ شقار؛ بڕۆش؛ بڕوێش؛ برێش؛ ولێشە؛ هڕووش؛ دانقوت؛ دانەوێلەی کولاوی بە دەستاڕکراو.

◘ **بلغور کردن**: /مجازی/ پەلخۆرکردن؛ بۆژوو کردن؛ شەقلێ‌پەقلێ قسەکردن؛ وراوە کردن؛ قسەکردنی وا کەسی تێنەگا ‹یارو دوماه خارج بوده، حالا انگلیسی بلغور می‌کند: کابرا دوومانگ لە هەندەران بووە، ئێستا ئینگلیسی پەلخور دەکا›.

**بلف** / b(e)lof, bolof، ـها/: [انگلیسی]/اسم. باپیڤان؛ تڕۆتۆپ؛ بافیش؛ خۆ هەلترێنی؛ کار یان ڕەوتی تۆپ وەشاندن؛ بە زگ خالی قورقێنەدان؛ شات و شووتکردن؛ پف لە خۆکردن بۆ ترساندن یان خاپاندنی کەسانی‌تر (وەک ئەوەی قوماربازی بە دەستی خالیەوە دەم لە سەرەوە بکوتێ و بەم جۆرە هاوقومارەکانی لە مەیدان دەرکا). هەروەها: **بلف زدن** ✻ **بُلوف**

**بلفضول** / bolfozûl/: [عربی] صفت. /ادبی، نامتداول/ خۆ تێهەلقولتێن؛ زۆر لاپرەسەن: **بُوالفضول**

**بلکه** / balke/: [عربی] قید. بەلکوو: ۱. بەشکەم؛ بەشکوو؛ بەشکم؛ دەشکەم؛ دەشقەم؛ بەشکی؛ بەشکێکۆ؛ بەشکا؛ بەشکێکم؛ بەشقا؛ شایەتا؛ تەکو؛ بەلک؛ بەلکا؛ بەلکی؛ بەلکە؛ بەلکەم ‹منتظر می‌شوم بلکه بیاید: چاوەڕێ دەبم بەشکەم بێت› ۲. زیاد لەوە؛ لەوە بەولا؛ نەک هەرئەوە ‹نه تنها پول نگرفت، بلکه پولی هم داد: نەک هەر پارەی نەسەند، بەلکوو پارەیەکیشی دا› ۳. بە پێچەوانەوە؛ بەراوەژوو ‹نه تنها درست نیست، بلکه بکلّی غلط است: نەک هەر ڕاست نیە، بەپێچەوانەوە تەواو هەلەیە›.

**بلم** / balam، ـها/: اسم. لۆتکە؛ بەلەم؛ قایەقی پچووکی چێوی کە بە پارۆ دەڕوا.

**بلند** / baland، ـها/: اسم. سەردەرانە؛ سەربەرانە؛ سەربەران؛ دەرازینک؛ دەرازین؛ دەرازوونە؛ داری سەرووی چوارچێوەی دەرگا. بەرانبەر: **آستان**

**بلند** / boland/: صفت. بەرز؛ وەرز؛ فراز؛ بلند؛ بلیند؛ بلنگ؛ بەل؛ عێلی: ۱. قەیل؛ قووچ؛ کێل؛ هۆ؛ هەلکێشراو بەرەو ژوور ‹درخت بلند: داری بەرز› ۲. قووچ؛ هۆ؛ قوتکە؛ مەوداگرتوو لە زەوی ‹جای بُلند: شوێنی بەرز› ۳. درێژ؛ قەیل؛ قووچ؛ کێل ‹چوب بُلند: چێوی درێژ› ٤. کێشراو؛ بە قەوەتی زۆرەوە

‹صدای بُلند: دەنگی بەرز› ٥. هۆ؛ سەرکەوتوو؛ خاوەن پلە و پایەی بە بایەخ و تایبەتی ‹نام بُلند: ناوی بەرز›.

▣ **بلند شدن:** ۱. هەڵسان؛ هەستان؛ هەستانەوە؛ هەڵسانەوە؛ ئاخێزان؛ ئاخێزیان؛ ئاخێزکردن؛ ئەوەهۆرسەی؛ هۆرسەیوە؛ لە جێ هەستان ‹بلند شد و نشست: هەستا و دانیشت› ۲. هەستان؛ هەڵسان؛ هۆرسەی؛ هۆرێستەی؛ بەرەو هەوا هەستان؛ بەرزەوە بوون؛ بەرز بوونەوە؛ بەرز بیەیوە ‹هواپیما از زمین بلند شد: فڕۆکەکە لە زەوی هەستا› ۳. بەرز بوون؛ بالاکێشان؛ هەڵدان؛ هۆردەی؛ هەرەش بیەی؛ بەرزەوە بوون؛ گەورە بوون ‹قدش بلند شده: بالای بەرز بووە› ٤. سەرهەڵدان؛ هەڵکردن؛ هۆرکەردەی؛ پەیا بوون ‹باد بلندشد: با هەلیکرد›.

**بلندکردن:** ۱. هەڵدان؛ هەڵکردن؛ بەرز کردنەوە؛ بردنە سەر ‹پرچم را بلند کرد: ئالاکەی هەڵدا› ۲. هەڵگرتن؛ هۆر گێرتەی؛ بەرزکردنەوە؛ هێز داین ‹از زمین بلند کرد: لە زەوی هەلیگرت› ۳. *[گفتاری]* هەڵگرتن؛ دزین؛ بردن؛ شاردنەوە؛ حەشاردان؛ دزیەی؛ هۆرگێرتەی ‹کتابم را بُلند کرده بود: کتێبەکەمی هەڵگرتبوو› ٤. *[گفتاری]* هەڵگرتن؛ ڕفاندن؛ هۆرگێرتەی؛ بە مەبەستی پێ ڕابواردن، کەسێک بۆ جێیەک بردن ‹دختری را بُلند کرده بود: کچێکی هەڵگرتبوو› ٥. بە خەبەرکردن؛ خەوەرەوکردن؛ هەڵساندن؛ هۆرزنەی؛ هەی کەردەیوە؛ هەیوەکەردەی ‹هر صبح از خواب بُلندش می‌کرد: هەموو بەیانیەک لە خەو هەڵیدەساند› ٦. درێژکردنەوە؛ درێژەوە کردن؛ قووچ کردنەوە؛ بەڵ کەردەیوە ‹موهایش را بلندکرده: قژی درێژکردوتەوە› ۷. بەرپاکردن؛ بەدی هێنان؛ بەرزکردنەوە ‹گرد و خاک بلند کردن: تۆز و خۆڵ بەرپا کردن› ۸. بەرزکردنەوە؛ فرەکردن؛ زۆرتر کردن؛ دانە بان ‹صدای رادیو را بلند کرده بود: دەنگی ڕادیۆکەی بەرز کردبووە›.

**بلندا** / bolandā/: *اسم. [ادبی]* بەرزایی؛ بەرزی؛ بەرزانی: ۱. ترۆپک؛ دوند؛ لووتکە؛ بەرزترین جێگەی شوێنێک ‹بلندای کوه: بەرزایی چیا› ۲. مەودای خوارەوە هەتا سەرەوەی ئەوەی کە ڕاوەستاوە ‹بلندای قامت: بەرزی بەژن›.

**بلندآوازه** / bolandāvāze، ـگان/: *صفت. [ادبی]* بەناوبانگ؛ ناسراو؛ ناودار؛ ناوبەدەر؛ بەرزەناو ‹شاعر بلندآوازە: شاعیری بەناوبانگ›.

**بلندبالا** / bolandbālā/: *صفت.* ۱. ـها؛ ـیان/ *[ادبی]* کەڵەگەت؛ بەژن‌بڵند؛ بالابەرز ۲. *[مجازی]* دوور و درێژ؛ درێژەدار ‹نامەی بلندبالا: نامەی دوور و درێژ› ❋ **بالابلند**

**بلندپایه** / bolandpāye، ـگان/: *صفت.* پایەبەرز؛ بڵندپایە؛ گەپ؛ پلەبەرز.

**بلندپرواز** / bolandparvāz، ـها؛ ـان/: *صفت.* بەرزەپەڕ؛ بەرزپەڕ؛ چاو لە بەرەو ژوور: ۱. بەرزەفڕ؛ خاوەنی حەز بە پێشڕەوتی زۆر کردنی (زۆرتر) نائاسایی ‹آزاد جوانی بلندپرواز بود: ئازاد گەنجێکی بەرزەفڕ بوو› ۲. بەرزفڕ؛ بە لێهاتوویی زۆرەوە بۆ فڕین لە بەرزاییدا ‹پرندگان بلندپرواز: پەلەوەرانی بەرزفڕ›.

**بلندپروازی** / bolandparvāzî، ـها/: *اسم.* بەرزەفڕی؛ بەرزەپەڕی: ۱. چۆنیەتی بەرزەفڕ بوون ۲. ڕەوتێک کە مەبەستی پێشکەوتنی توند و خێرا بێ.

**بلندقامت** / bolandqāmat، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بالابەرز؛ بەژن بەرز ‹مردی بلندقامت بود: پیاوێکی بالابەرز بوو›.

**بلندقد** / bolandqad(d)، ـها/: [فارسی/ عربی]

صفت. شەقارە؛ بالابەرز؛ بە بالای بەرزتر لە نێونجێ.

**بلندگو** / bolandgû/:اسم. بلندگۆ: ۱. /ـها/ دەنگەوەرە؛ ئامرازی دەنگ بلێندکەر ‹صدای آذان از بلندگو بە گوش می‌رسید: دەنگی بانگ لە بلندگووە دەبیسرا› ۲. [تعریض] ڕاگەیێنەر؛ پڕۆپاگەندەچی ‹شده بود بلندگوی خان: ببووە بلندگوی خان›.

**بلندمازو** / bolandmāzû، ـها/:اسم. مازیر؛ ڕەشە مازوو؛ مازووە ڕەشە؛ دارێکە لە تیرەی بەڕوو بە بەرزایی دەوروبەری ٤٠ میتر، چێوێکی سەخت و میوەی هێلکەیی هەیە: **سیاەمازو**

**بلندمدت** / bolandmoddat/: [فارسی/ عربی] صفت. درێژخایێن؛ درێژخایەن.

**بلندمرتبه** / bolandmartabe، ـها/: [فارسی/ عربی] صفت. ۱. پایەبەرز؛ پایەبلند؛ بنیادەمی جێ بەرز ۲. [معماری] بەرزەماڵ؛ بە نهۆم و تاوچین و مەرتەبەی زۆرەوە.

**بلندمرتبه‌سازی** / bolandmartabesāzî/: [فارسی/ عربی/ فارسی]/اسم. کار یان ڕەوتی کردنەوەی خانووی زیاتر لە ١٠ نهۆم.

**بلندنظر** / bolandnazar، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. بەرزەمژ؛ دلـڤەرا: ۱. خاوەن خووی چاوپۆشی کردن ۲. خاوەن هەست و بیری بەرز * **نظربلند**. هەروەها: **بلندنظری**

**بلندهمت** / bolandhemmat، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. ۱. بە ویست و گاڤینی بەرزەوە ۲. بەرزەمژ؛ خاوەن هەست و بیری بەرز. هەروەها: **بلندهمتی**

**بلندی** / bolandî، ـها/:اسم. بەرزی: ۱. وەرزە؛ بلندی ‹جای بە این بلندی: جێی بەم بەرزییە› بەرانبەر: **پستی** ۲. بلندایی؛ بلندایەتی؛ بەرزایی؛ بەرزایەتی؛ بلندی؛ گست؛ هۆل ‹روی بلندی ایستاد: لە سەر بەرزاییەوە وەستا› ۳. بەرزایی؛ بالا ‹بلندی درخت: بەرزی دار›.

**بلندی‌هراسی** / bolandîharāsî/:اسم. [روانشناسی] ترس لە بەرزایی.

**بلوا** / balvā، ـها/: [عربی]/اسم. ئاژاوە؛ ئاژاولە؛ ئاشۆ؛ تەوەرە؛ گاشە؛ پشێوی؛ بشێوە؛ ئالۆزی؛ خارۆرە؛ خڕین؛ کێشەوهەرا؛ هەرکەس هەرکەسی؛ کێ بە کێیی؛ گۆتاڵ؛ بشێوە؛ گۆتاوەڕۆ؛ کەس‌لەکەسی.

**بلوار** / bûlvār,bolvār/: [فرانسوی] ☜ **بولوار**

**بلوچ** / balûč/:اسم. بەلووچ: ۱. خێلێک لە بنەچەی ئێرانی، دانیشتووی بەلووچستان ۲. /ـها؛ ـان/ خەڵکی بەلووچستان.

**بلوچی**[1] / balûčî/:اسم. بەلووچی؛ زمانی خێڵی بەلووچ، لە زمانە ئێرانیەکان.

**بلوچی**[2]: صفت. بەلووچی؛ سەر بە خێلی بەلووچ.

**بلوچی‌تریم** / balûčîteryom/: [؟]/اسم. بەلووچی‌تریۆم؛ زلترین گواندار وشکی لە چاخی میۆسن، کە وەک بەراز بووە و لە ئاسیای ناویندا پەیکەریان دۆزیوەتەوە.

**بلور** / bulûr, bolûr، ـجات؛ آلات/: [معرب از یونانی]/اسم. قەورک؛ بلوور؛ بللوور؛ بلۆر؛ جۆرێک شووشەی بێ گەرد و گرێ و ئەستوور.

**بلورآلات** / bulûrālāt/: [معرب/ عربی]/اسم. بلوور؛ بلۆریات؛ کاڵای لە بلوور چێ‌کراو.

**بلورسازی** / bulûrsāzî/: [معرب/ فارسی] /اسم. بلوورسازی: ۱. کار یان ڕەوتی دروست کردنی شتی بلوورین ۲. /ـها/ کارخانەیەک کە بلووری تێدا دروست دەکەن ۳. پیشەی بلوورساز.

**بلورشناسی** / bulûršenāsî/: [معرب/ فارسی] /اسم. بلووزناسی؛ زانستی خوێندنەوەی کەسمی هەندەسی، پێکهاتە و شێوازی

ویگرسانی بلووران.

**بلـوره** / bulûre/: [معـرب/ فارسـی] /اسـم. بلـوور؛ بلۆر؛ کریستاڵ.

**بلـــوری** / bulûrî/: [معـرب] صـفت. بلـۆری؛ بلـوورین؛ بلـۆرین: ١. دروسـت‌کـراو لـه بلـۆر ‹جـام بلـوری: جـامی بلـوری› ٢. /مجـازی/ وه‌ک بلۆر ‹اندام بلوری: ئه‌ندامی بلوری›.

**بلــورین** / bulûrîn/: [معـرب/ فارسـی] صـفت. /ادبی/ بلـوورین؛ وه‌ک بلـۆر ‹جـام بلـورین: جـامی بلوورین›.

**بلورینـه** / bulûrîne، ـهـا/: [معـرب/ فارسـی] /اسـم. /ادبی/ بلووروالّه؛ بلوورینه؛ بلۆریات.

**بلـــوز** / bulûz, bolûz، ـهـا/: [فرانـسوی] /اسـم. بلووز؛ بلووس؛ فانیلـه؛ جلکـی کـورتی نـه‌رم لـه پارچـه یـان چنـراوه‌یـه‌ک کـه دەبـه‌ر ده‌کـرێ: **بُلیز**

**بلـــوط** / balût، ـهـا/: [از کـردی] /اسـم. بـه‌ڕوو؛ بـه‌لـوو؛ بـه‌ڕی؛ بـه‌لی؛ بـه‌ری: ١. نـه‌ره؛ دار به‌ڕوو؛ دار بـه‌ڕوار؛ بـه‌ڕوو دار؛ دارێکـی لێـڕی و لــه کـــوردەواری زۆرناســـراوه ٢. بـــه‌ری دار به‌ڕوو، که ده‌نکێکی مـه‌یلـه‌و خۆرمـایی بـه‌قـه‌د دانـه‌بادامێـک یـان هێنـدێک گـه‌وره‌تـره و ده‌خورێ.

**بلـــوطی**[1] / balûtî/: [کـردی] /اسـم. بـه‌ڕوویـی؛ به‌لوویی؛ ڕه‌نگی خورمایی کاڵ: **بلوطی‌رنگ**

**بلـــوطی**[2]: صـفت. بـه‌ڕوویـی؛ بـه‌لـوویی؛ بـه ڕه‌نگی خورمایی کاڵ.

**بلـــوغ** / bulûq, bolûq/: [عربـــی] /اســـم. ١. پێگـــه‌یـــوی؛ بلـــۆق؛ بلۆقـــه‌ت؛ خۆناســـی؛ پنـه‌یـاوه‌ی؛ ڕه‌وتی لـه منداڵـی پـه‌ڕینـه‌وه ٢. پێگـه‌یـشتوویی؛ دۆخ یـــان چۆنیـــه‌تی باڵـــغ بوون ‹سن بلوغ: ته‌مه‌نی پێگه‌یشتوویی›.

**بلوف** / bolof/: [انگلیسی] ☜ **بُلُف**

**بلـــــوک** / bulûk, bolok, b(e)lok، ـهــا/: [فرانـسوی] /اسـم. ١. خـشت؛ بلـووک؛ بلووکـه ‹بلـوک سـیمانی: خـشتـی سـیمانی› ٢. بـه‌ره؛ کـۆدێن؛ کۆمـه‌ڵـێک ماڵـی پـاڵ پێکـه‌وه‌داو ‹بلـوک مـسکونی: بـه‌ره‌ی نیـشته‌جێیی› ٣. بـه‌ره؛ ده‌سـته ‹بلـوک شـرق: بـه‌ره‌ی ڕۆژهـه‌ڵات› ٤. /قـدیمی/ بـه‌ش؛ پـاژ؛ ناوچـه ‹بلـوک لرسـتان: به‌شی لوڕستان›.

◙ **بلوک سیمانی:** خشتی سیمانی.

**بلـوک شـرق:** بـه‌ره‌ی ڕۆژهـه‌ڵات؛ بـه‌شـی وڵاته سوسیالیستیه‌کان.

**بلوک غـرب:** بـه‌ره‌ی ڕۆژاوا؛ بـه‌شـی وڵاتـانی سه‌رمایه‌داری.

**بلـوک‌زنـی** / bulûkzanî, bolok-, b(e)lok-/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. خشت‌بڕی؛ کار یان ڕه‌وتی دروسـت‌کـردنی خـشتی سـیمانی. هـه‌روه‌ها: **بلوک‌زن**

**بلونـــد** / b(e)lond/: [فرانـسوی] صـفت. کـاڵ؛ مووکـاڵ؛ کـرچوکـاڵ؛ پێـست سـپی و مـوو زه‌رد.

**بله** / bale/: [از عربی] ☜ **بلی**

**بلـــه** / bolh/: [عربـی] صـفت. گـه‌وج؛ نـه‌فـام؛ نه‌زان؛ گێل؛ بێ‌ئـاوه‌ز؛ گێـژ؛ حـه‌پـه؛ ده‌بـه‌نـگ؛ بـلـح؛ وڕ؛ گـێج؛ گێلۆکـه؛ گـه‌مـژه؛ ولـه‌ژاو؛ فه‌حه.

**بلـه‌بـران** / baleborān/: [از عربـی/ فارسـی] /اسـم. ماڵ‌بـڕ؛ قـه‌تـح‌وبـڕ؛ ده‌س مـاچ‌کـردن؛ بـه‌نـد و بـاوێکی پـێش زه‌مـاوه‌نـد کـه چۆنیـه‌تی کـار و بار و ڕه‌وتی زه‌ماوه‌ندی تێدا ده‌بڕێته‌وه.

**بلهـوس** / bolhavas، ـهـا؛ ـان/: [؟/ عربـی] صـفت. که‌ڵکه‌ڵه‌باز؛ هه‌وه‌سباز؛ ئاره‌زووباز: **بُوالهوس**

**بلهوســانه** / bolhavasāne/: [؟/ عربـی/ فارسـی] قید. هه‌وه‌سبازانه: **بُوالهوسانه**

**بلهوســـی** / bolhavasî، ـهــا/: [؟/ عربـی] /اسـم. کـه‌ڵـکه‌ڵـه‌بـازی؛ هـه‌وه‌سـبازی؛ دۆخ یــان چۆنیـــه‌تی کـــه‌وتنـــه شـــوێن هـــه‌وا و هه‌وه‌سگه‌لی که‌م‌خایه‌نه‌وه: **بُوالهوسی**

**بلـی** ¹ / balî/: [عربـی]/اسـم. بـەڵـێ؛ ئـەرێ؛ بـەرێ؛ لـەبـێ؛ پـەرسـڤی ئـەرێـنی و پـەسـند کەرەوە ‹هرگز بلی نمی‌گوید: قـەت نالـێ بـەلـێ›: **بله** *[گفتاری]*؛ **بعله** *[گفتاری]*

**بلی** ²: *قید.* بـەلـێ؛ بـەرێ؛ بـلەڵ: ۱. ئـەرێ؛ ئـا؛ نیشانەی هـاوبیری ‹این لباس خـوب است؟ بلـی: ئەم بەرگە باشە؟ بـەلـێ› ۲. ڕاسـتە؛ ڕاسـا؛ وایـە؛ بۆچی؛ پاسەنـە؛ نیـشانەی چـەسـپاندن ‹بلـی، از ایـن کارهـا زیـاد مـی‌کـند و سـزایش را خواهـد دیـد: بـەلـێ، زۆر لـەم کارانـە دەکـا و سزاشـی دەبینێتـەوە› ۳. نیـشانەی لـەگـەڵ نـەبـوون و دژایـەتی ‹بـاز هـم مـی‌روی؟ بلـی کـە مـی‌روم: دیـسان دەچـی؟ بـەلـی، بـۆ نـەچـم؟› ❊ **بلـه** *[گفتاری]*؛ **بعله** *[گفتاری]*

**بلـی** ³: *صـوت.* بـەڵـێ؛ بـەرێ؛ هۆبـەلـێ؛ هەوبەلێ؛ وشەیەک کە بژنـەو بـۆ ئامـادە بـوون دەیـژێتی ‹گفـتم: حـسن! گفـت: بلـی: وتم: حـەسـەن! وتی: هۆبـەلـی›: **بلـه** *[گفتـاری]*؛ **بعلـه** *[گفتاری]*

**بلیات** / balîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **بَلیّه**

**بلیارد** / belyārd/: [از فرانسوی] ☜ **بیلیارد**

**بلیـت** / bilît, belît/، ـهـا/: [از فرانـسوی]/اسـم. بـلێت؛ بلیت؛ پـسوولە؛ پـەتـە؛ پـەڕەیـەکـی چاپی چکۆلە کـە بنکـەیـەکـی ڕاژەیـی گـشتی (وەک هێـلـی ئاسـن، فڕۆکـەخانـە، سینەمـا) بـە کـڕیارانی خـۆی دەفرۆشـێ تـا بتـوانن لـەو ڕاژەگەلە کەلک وەربگرن: **بلیط**

▣ **بلیـت بخـت‌آزمـایی:** پـشک؛ لاتـاری؛ قورعە؛ پسوولەی خۆ و بەخت.

**بلیـت‌فـروش** / -bilîtfurûš, belît/، ـهـا؛ ـان/: [از فرانـسوی/ فارسـی]/اسـم. پـسوولەفـرۆش. هەروەها: **بلیت‌فروشی**

**بلیتـی** / bilîtî, belîtî/: [از عربـی] *صفت.* بلـیتی؛ بـلیت‌خـواز؛ بـەپـەتـە؛ نیازمـەنـدی پێـدانی پـسوولە ‹ایـن اتوبوسها بلیتـی نیـست، پـولی است: ئەم پاسانە بلیتی نین، پارەیین›: **بلیطی**

**بلیز** / bolîz/: [از فرانسوی] ☜ **بُلوز**

**بلیط** / bilît/: [از فرانسوی] ☜ **بلیت**

**بلیطی** / bilîtî/: [از فرانسوی] ☜ **بلیتی**

**بلیـــغ** / balîq/: [عربـــی] *صـــفت. [ادبـــی]* ۱. دەمپـاراو؛ نبێـژ؛ قـسەڕەوان؛ وتـەپـاراو ‹شـاعر بلیـغ: شـاعیری دەمپـاراو› ۲. ڕەوان؛ پـاراو ‹شعر بلیغ: شیعری پاراو›.

**بلیـــوار** / bolîvār/: [؟]/اسـم. بولیـڤار؛ پـارەی وڵاتی ونزۆئیلا.

**بلیون** / belyon/: [فرانسوی] ☜ **مِلیارد**

**بلیـه** / balîyye، ـهـا؛ بلایـا؛ بلیـات/: [عربـی]/اسـم. *[ادبی]* بەلا؛ چـەترمـە؛ چـەل؛ گرگاشـە؛ بلێـشە؛ دومـات؛ وەی؛ چـورتم؛ چـەمـەری؛ وەیـشوومە؛ کۆسـپ و تـەگـەرەی زۆر دژوار ‹بلیـەی سـختی بود: بەلایەکی گەورە بوو›.

**بم** / bam/: *صفت.* ۱. بـەم؛ بـۆڵ؛ کـۆر؛ دەنگـی بـەم (وەک دەنگـی تـەپـڵ) ۲. گـڕ؛ زل؛ قـەوی؛ قـەیم؛ کـلفت؛ کولـفت؛ کـەلـەفـت؛ دەنگـی کولفت (وەک دەنگی پیاو). بەرانبەر: **زیر**

**بمـــان** / bemān/: *صـفت. [گفتـاری]* مێنـــەر؛ بمـێن؛ خۆگرتـوو؛ مانگـار؛ مێنـەرەوە ‹فکـر مـی‌کـردیم او اینجـا بمـان نیـست: وەمـان دەزانی لێرەدا مانگار نیە›.

**بمـب** / bomb، ـهـا/: [فرانـسوی از ایتالیـایی]/اسـم. قەمبەرە؛ بۆم؛ بـووم؛ بومبـا؛ گـوللەیـەکی زەلام کە زیاتر بە فڕۆکە دەهاوێژرێ.

▣ **بمب آتشزا:** بـومبی‌ئـاورزا؛ بومبـێ کـە پـاش تـەقینـەوە ئـاور دەگـرێ (وەکـوو بـومبی ناپالم).

**بمب اتمی:** بـومبی ئـەتـومی؛ جـۆرێ بـومبی زۆر بەهێزە کـە ئـەو هێـزەی لـە شکانەوەی ناوکی ئەتوم پێکدێ.

**بمـب خوشـه‌ای:** بـومبی‌هێـشوویی؛ بـومبی هۆشـەیـی؛ جورێـک بومبـە کـە لەگـەڵ

تەقینـــەوە، زۆرێـــک وردە بـــومبی لـــێ دەبێتـــەوە و هـــەرکام بـــە لایەکـــدا پـــەرت دەبن و دەتەقێنەوە.

**بمـب دسـت‌سـاز**: بـومبی دەس‌ساز؛ بومبـێ کە بە دەس چێ کرابێ.

**بمب دستی**: بومبی دەستی.

**بمب ساعتی**: بـومبی کـاتژمێری؛ بومبـێ کـە لە سەر کاتی دیاریکراودا دەتەقێتەوە.

**بمـب شـیمیایی**: بـومبی کیمیـاوی؛ بومبێکـە بــەجێ ئــاور دووکەڵـێکی زینـدەوەر کـوژ بڵاو دەکاتەوە.

**بمب ناپـالم**: بـومبی ناپاڵـم؛ جۆرێـک بـومبی ئاورزایە.

**بمـــب هیـــدروژنی**: بـــومبی هیـــدرۆژێنی؛ جورێـک بـومبی یـەکجار بـەهێـزە کـە بـە شکاندنی ناوکی ئەتوم دەکەوێتە کار.

**بمبـاران** / bombārān، ـهـا/: [فرانسی/ فارسی] /اسم. بوردومان؛ بومبابـاران؛ بومبـاران؛ کـار یـان ڕەوتی بومبا هاویشتن؛ بومبا داڕژاندن.

▣ **بمبـاران شـدن**: بومبـاران‌کـران؛ بومبـاران بـوون ‹سـال ۱۳۶۶ حلبچـه بمباران شـد: سالـی ۱۳٦٦ هـەڵـەبجـە بومبـاران کـرا›. هـەروەهـا: **بمباران کردن**

**بمـــب‌افکـــن** / bombafkan/: [فرانـــسوی/ فارسی] ☜ هواپیمای بمب‌افکن، **هواپیما**

**بمـــب‌انـــدازی** / bombandāzî، ـهـــا/: [فرانـــسوی/ فارســی] /اســم. ۱. بومـــب‌هـــاوێژی؛ خـستنی بومبـای دەسـتی ۲. بومـب‌تـەقێنی؛ کار یان ڕەوتی تەقاندنەوە؛ تەقینەوە.

**بمـــب‌گـــذار** / bombgozār، ـهـــا؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. بومـب‌ڕێـژ؛ کـەسـێ کـە بۆ تەقاندنەوەی جێگایەک بومب دەچێنێ.

**بمـــب‌گـــذاری** / bombgozārî، ـهـــا/: [فرانسوی/ فارسـی] /اسم. بومـب‌ڕێـژی؛ کـار یـان ڕەوتی دانـــانی بومـــب لـــە شـــوێنێک بـــۆ تەقینەوە.

**بمـــل** / bemol/: [فرانـــسوی] /اســم. /موســـیقی/ بیمـول؛ نیـشانەیێکـە لـە نـوت نووسـیدا کـە ئـەگـەر وەپـێش نۆتـەکـە بکـەوێ دەنگـی نیوپەردە دادەبەزێنێ.

**بموقـــع** / bemoqe'/: [فارســی/ عربــی] قیـد. بەجێ؛ بەگاف؛ لە سەروەخـت؛ لـە کـاتی شـیاو یان پێش‌بینی‌کراودا.

**بن** / bon، ـها/: /اسم. ۱. /ادبی/ بـن؛ بنـە؛ بـێخ؛ خـواروترین شـوێن یـان ڕوو ‹بن چاه: بنـی بیر› ۲. بن؛ بنـە؛ بـێخ؛ ڕەگ و پـنج؛ بنـەچـڵ؛ بنچـەکـە؛ ڕیـشە ‹بن درخت: ریشەی دار› ۳. /دستور/ ڕەگ؛ بەشێک لـە چاوگ یـان کـار کـە لـە پێکهاتـەگـەلی جۆراوجـۆردا وەک خـۆی دەمینێتـەوە و گۆڕانکـاری لـێ ڕوو نـادا. واتـای سـەرەکـی کـار لـە ڕەگـەوەیـە و هـەروەهـا وشـەی ڕیـشەداری لـێ‌دروسـت دەبـێ ‹بن ماضی؛ بن مضارع آوردن، آور است: رەگی ڕابـردوو؛ رەگـی داهـاتووی هێنـان، ئـێن/ هـێن‌ە› ٤. بنـەڕەت؛ بناغـە؛ بناخـە؛ بـن؛ بنـە؛ بـێخ؛ شەنگـەسـتە؛ بنچینـە؛ بنـاوان ‹از بیخ و بن: لە بنـەڕەتـەوە› ٥. [فرانـسوی]کـوپین؛ بـون؛ بـەرگـەی یارمـەتی دەوڵـەت بـۆ خـەڵـک ‹بن قند و شکر: کوپینـی قەن و شەکر›.

**بنـا** / banā, benā، ـهـا/: [عربـی] /اسم. ۱. /ابنیه/ مـاڵ؛ خانووبـەرە؛ دەزگـا؛ عـەمـارەت ‹بنـای بلنـدی اسـت: خانووبـەرەیـەکـی بـەرزە› ۲. بـڕیار ‹بنـا شـد نـرویم: بڕیار درا نـەڕۆیـن› ۳. بناغـە؛ بنچینـە؛ بـن؛ بنـەڕەت؛ پێـز؛ ڕەچـەڵـەک؛ بنـاوان؛ ڕەتـەوە ‹بنـای ایـن کـار را او گذاشـت: بناغەی ئەم کارە ئەو داینا›.

▣ **بنـابراین**: کـەوایـە؛ بـەم بۆنـەوە؛ بـەم پێیـە؛ لـەم ڕووەوە؛ کـە وابـوو؛ چـی ڕووەوە؛ پـێ بۆنـەوە؛ سـا؛ دەیـسا؛ کـە پیـسەنـە؛ کـە پاسەنە؛ ئـی پیـسە بـۆ؛ بـەم گـوێرە ‹بنابراین

باید زودتر برویم: کەوایە دەبێ زووتر بڕۆین›.

**بنای یادبود:** مێنیۆمێنت؛ خانوویەک کە بۆ بیرئانینەوەی ڕووداوێک چێ کرابێ.

▣ **بنا بودن:** بڕیار بوون؛ قەرار بوون ‹بنا بود روز جمعه برویم کوه: بڕیار بوو ڕۆژی هەینی بچینە کێو›.

**بنا داشتن:** ویستن؛ گەرەک بوون؛ هەرەک بوون؛ تواسن؛ گەرەک بیەی ‹بنا داشتم از اینجا بروم: ویستم لێرە بڕۆم›.

**بنا شدن:** ١. کرانەوە؛ کریایوە؛ کرانەوەی ماڵ ‹این خانه تازه بنا شده است: ئەم ماڵە تازە کراوەتەوە› ٢. بڕیار دران؛ بڕیار وا بوون ‹بنا شد همه با هم برویم: بڕیار درا هەموو پێکەوە بچین›.

**بنا کردن:** ١. کردنەوە؛ سازکردن؛ هەڵخستن؛ کەردەیوە؛ درووس کردنی خانوو ‹دولت در اینجا مدرسه‌هایی بنا کرد: دەوڵەت لێرەدا چەند قوتابخانەیێکی کردەوە› ٢. دەس پێ کردن؛ خەریک بوون؛ دەس پنەکەردەی ‹از آن روز بنا کرد به ناسازگاری: لەو ڕۆژەوە دەستی کردووە بە نەگونجاوی›.

**بنا گذاشتن:** ١. بنیات نان؛ بناخە داڕژتن؛ پەیڕێژی کردنی خانووبەرە یان دامەزراوەییێک ٢. بڕیار دان ‹این طور بنا گذاشتیم که فقط یک نفر حرف بزند: وا بڕیارمان دا تاقەکەسێک قسە بکات›.

**بنا** / bannā، ـها؛ ـیان/: [عربی]/اسم. بەننا؛ بەنا؛ گلکار؛ سواکین؛ وەستای خانوو.

**بنائی** / bannā' î/: [عربی] ☜ **بنّایی**

**بنات‌النعش** / banātonna'š/: [عربی]/اسم. [نجوم] حەوتەوانان؛ هەفتبرا؛ حەوبرا؛ حەوت‌براله؛ حەوت‌برا؛ چارەگا.

▣ **بنات‌النعش صغرا(صغری)** ☜ خرس کوچک، **خرس**

**بنات‌النعش کبرا(کبری)** ☜ خرس بزرگ، **خرس**

**بناحق** / benāhaq/: [فارسی/عربی] ☜ **بەناحق**

**بنادر** / banāder/: [معرب از فارسی] جمعِ ☜ **بَندَر**

**بناگوش** / banāgûš, bonāgûš، ـها/: اسم. بناگوێ؛ بنانگوێ؛ بنانگوێچکە؛ پەناگوێ؛ بنەگۆش؛ گۆشەک؛ گلگەی گووش؛ پەنای گوێچکە؛ بنێ گوهی؛ بەینی بنی کاکیلە و گوێ.

**بناگوشک** / banāgûšak/: اسم. ملەخرە؛ نەخۆشیەکی (زۆرتر) منداڵانە، لکی بناگوێ زۆر هەڵدەماسێ و مل ئەستوور دەبێ: **اُریون**

**بنام** / benām/: صفت. بەناوبانگ؛ ناودار؛ بەنێوبانگ؛ ناقدار؛ نامدار؛ ناسراو؛ نێودار؛ سەروەدەر ‹دانشمند بنام: زانای بەناوبانگ›.

**بنایی** / bannāyî/: [عربی]/اسم بەنایی؛ نهانی؛ نقانی: ١. قوڕەکاری ٢. پیشەی بەنا * **بنائی**

**بن‌بست**[1] / bonbast, bombast، ـها/: اسم. ڕێ‌کورک؛ بن‌بەست؛ بتەو: ١. ڕێگایەک (بەتایبەت کۆڵان) کە سەرێکی دەرناچێ ‹بن‌بست اوّل، پلاک ٢٥: ڕێ‌کورکی یەکەم، ژمارەی ٢٥› ٢. [مجازی] بار و دۆخی بێ‌دەرەتانی.

▣ **به بن‌بست رسیدن:** [کنایی] قەتیس مان؛ بێ‌دەرەتان بوون؛ دەرەتان لێ بڕیان؛ بێ‌دەرباز مان؛ ڕێ‌چارەیێک بۆ گیر و گرفت نەدۆزینەوە.

**بن‌بست**[2]: صفت. بن‌بەست؛ ڕێ‌کورک؛ بە بێ ڕێ دەرچوون (بۆ ڕێگا دەگوترێ) ‹کوچەی بن‌بست: کۆڵانی ڕێ‌کورک›.

**بنجک** / boncak، ـها/: اسم. کەلوو؛ تۆپەڵی پەموو؛ پەمووی شی‌کراوی تۆپەڵ کراو.

**بنجل**[1] / boncol، ـها/:/سم. قرپۆک؛ بنۆک؛ قرپۆڵ؛ ئەیاغ؛ چرووک؛ کالایەک کە بە هۆی مانەوە لە هەمباردا دارزاوە یان کۆنە بووە و لە باو کەوتووە.

**بنجل**[2]: صفت. بێبایەخ؛ بێنرخ؛ قرپۆک؛ بنۆک؛ قرپۆڵ؛ ئەیاغ؛ چرووک؛ لاکەوتە؛ مەراش؛ بێبرەو (بەتایبەت بۆ شتومەک).

**بنجلخر** / boncolxar، ـها/: صفت. گەنەخەر؛ گەنەخڕ؛ قرپۆکسێن؛ ئەیاغسێن؛ هۆگر بە سەندنی شتی بێکەڵک و بەکارنەهاتوو دەکرێ. هەروەها: **بُنجُلخری**

**بنجلفروش** / boncolfurûš، ـها/: صفت. گەنفرۆش؛ قرپۆڵفرۆش؛ کەسێ کە شتی بێبایەخ دەفرۆشێ. هەروەها: **بُنجُلفروشی**

**بنچاق** / bončāq، ـها/: [ترکی]/سم. بنچاخ؛ بەڵگەی خاوەنداریەتی.

**بند**[1] / band، ـها/:/سم. بەن؛ بەند: ١. هەودا؛ پەت یان ڕێسمانێک بۆ بەستنی شتێک ‹بند کفش: بند ساعت: بەنی کەوش؛ بەندی ساعەت› ٢. تەناف؛ گوریس یان سیرمێ کە بۆ کارێکی تایبەت تەرخان کراوە ‹بندباز روی بند راه می‌رفت: تەنافباز لە سەر تەنافەکەوە دەڕۆیشت› ٣. بەشێکی سەر بە خۆ یان جیاواز لە کۆمەڵێک ‹بند زندان: بەندی زیندان› ٤. گە؛ گەهـ ؛ گەهە؛ جمگە؛ بەندی پێشە ٥. بەست؛ دیواری بەرگری ئاو: **بندِآب** ٦. مەودای نێوان دوو ئاجۆر لە دەرەوەی دیواردا ٧. /ادبی/ زیندان؛ بەندیخانە ‹کسی را کە در بند بینی مَخَند: کە دیتت یەکێک بەندیە، تیز مەکە›.

▣ بند آب ☜ **بند ـ٥**

**بند انگشت**: ١. بەندی قامک؛ بەن ئەنگووس؛ وەندی پل؛ زاک کلک؛ بنگەی تل ٢. گە؛ گەهـ ؛ گەهە؛ مەودای نێوان دوو جومگەی قامک.

**بند تنبان**: /قدیمی/ دۆخین؛ بەنەخوێن؛ دیخوون؛ دێخوون؛ هۆجەنە؛ هۆچنە؛ وەنجەنە؛ گونجەنە؛ بەنشواڵێن؛ فرێتی ڕاگری پاتۆڵ کە بە دەور کەمەردا توند دەبێتەوە: **بند شلوار**

**بند تنبانی**: /کنایی/ ئاوەکی؛ سست؛ بنشڕ (زیاتر بۆ شیعر و نووسراوە دەگوترێ).

**بند دل**: بەندڵ؛ بەندی دڵ؛ بەنەندڵ؛ وەنەنە دڵ؛ (وەک دەڵێن) هەودایەک کە دڵی ڕاگرتووە.

**بند رخت**: تەناف؛ تەنافەو جلا؛ ئەو بەنە جلکی لە سەر ڕادەخەن وشک بێتەوە.

**بند ساعت**: بەن ساعەت؛ دەسکە سەعات؛ ئەو بەنە سەعات بە دەستەوە دەبەستێ.

**بند شلوار**: ١. ☜ **بند تنبان** ٢. کێش شەڵوار؛ ئەو کێشە ئەکەوێتە سەرشان و شەڵوار ڕادەگرێ.

**بند کاغذ**: بەندی کاغەز؛ بەستەیەک کاغەزی چاپ کە زۆرتر ٥٠٠ پەڕەی (٩٠×٦٠) یان (٧٠ × ١٠٠) سانتیمیترە.

**بند کفش**: بەن کەوش؛ بەنوو پاڵەی؛ ئەو بەنە کەوشی پێ دەبەسترێ.

**بند کیف**: بەن کیف؛ نەوارێکی لە چەرم یان پارچە کە بە دووسەری کیفەوە بەستراوە و دەخرێتە سەر شان.

**بند ناف**: ١. ناوک؛ نەهە ٢. بەنی ناوک؛ ڕەگوونەهەی؛ لوولەی بڕیو پێگەیێنی زارۆ پێش لە دایک بوون.

▣ **بند از بند جدا کردن**: پەل‌ـپەل کردن؛ شەل و پەل کردن: ١. لەتوپەت کردن؛ ڕیزاڵ‌ـ ڕیزاڵ کردن؛ لەتوکوت کردن؛ گنجڕ ـگنجڕ کردن؛ ونجڕ ـ ونجڕکردن؛ شیتاڵ‌ـشیتاڵ کردن؛ جن‌ـجن کردن ٢. /کنایی/ چەرمی کەسێ دەق کردن؛ زۆر

ئازار دان.

**بند آمدن:** بەسران؛ بەسیان: ١. مدرایەوە؛ گرسایەوە؛ وەستانەوەی گەڕیانی تراوێک ‹بند آمدن خون: خوێن بەسران› ٢. گیران؛ گیریان؛ بینیەی؛ نەمانی هاتوچوو ‹راه بند آمده بود: ڕێگە بەسرا بوو›.

**بند انداختن:** ڕوومەتگرتن؛ ڕوە گێرتەی؛ هەڵکێشانی گەنەمووی دەس و دەموچاو بە بەن.

**بند آوردن:** بەستن؛ بینەی؛ ڕێی شتێ گرتن ‹راه را بند آوردن: ڕێگە بەستن›.

**بند آوردن خون:** زەمتاندن؛ گرساندنی خوێن.

**بند بستن:** ١. بەستنەوە؛ بەن پێوە بەستن؛ بەن پێبەستنەوە؛ بەن پوەبینەی؛ بەن بە شتێ یان جێکەوە هەڵواسین ٢. بەند هەڵبەستن؛ بەربەند بەستن؛ بەروەن لێدان؛ بەنگا هۆربینەی؛ بەندی ئاو دروستکردن.

**بند بودن:** ١. گیر بوون؛ بەن بوون؛ وەن بیەی؛ بە شتێکەوە بەسران ‹تنها به یک میخ کوچک بند است: تەنیا بە تاقە بزمارێکی چکۆلەوە گیرە› ٢. گیریان؛ گیریەی؛ بە شتێکەوە خەریک بوون ‹دستم بند بود: دەستم گیرابوو›.

**بند پاره کردن:** */تعریض/* پەت بڕین؛ هەڵتووزاندن ‹باز امروز آزاد بند پاره می‌کند: دیسان ئەوڕۆش ئازاد پەت ئەبڕی›.

**بند دل پاره شدن:** */کنایی/* بەندڵ بڕیان؛ دڵ داکەوتن/ داکەفتن؛ تۆقەی؛ زۆر ترسان و ڕاچڵەکان.

**بند را آب دادن:** */کنایی/* قەوماندن؛ دەسەگوڵ دانە ئاوا؛ پەندان؛ کەتنە ژەی؛ هەڵەیەکی گەورەکردن ‹بالاخره بند را آب دادی: ئاخری قەوماندت›.

بند زدن ☜ **بَندزَنی**

**بند شدن:** گیر بوون: ١. بە شتێکەوە لکان ‹دستم به یک شاخه بند شد: دەستم بە لقێکەوە گیر بوو› ٢. جێگیر بوون؛ کەوتەینە وەن؛ لە شوێنێکدا مانەوە ‹دو روز در یک جا بند نمی‌شد: دوو ڕۆژ لە شوێنێکدا گیر نەدەبوو›.

**بند کردن:** ١. گیردان؛ بەستنەوە؛ پێوە بەستن؛ بینایوە؛ پوەبینەی؛ لکاندن؛ لکنەی؛ وەندن؛ بەندان؛ بەندکردن ‹قلاب را به گیره بند کرد: قولاپەکەی بە گیرەکە بەستەوە› ٢. بەستنەوە؛ گیرۆدەکردن؛ وەنسە کردن؛ بینایوە ‹خودش را به حزب بند کرد: خۆی بەستە حیزبەوە› ٣. پێدا پێچان؛ هەڵپێچان؛ گیردان؛ گیرپێدان ‹چرا به من بند کرده‌ای؟: بۆچی بە مندا پیچاوی؟›.

بند کشیدن ☜ **بَندکِشی**

**از بند رستن:** */کنایی/* ئازاد بوون؛ ڕزگار بوون؛ لە بەند بەر بوون.

**به بند کشیدن:** */کنایی/* زیندانی کردن؛ بە دیلگرتن؛ دۆساخکەردەی؛ گرتنی ئازادی کەسێک: **در بند کردن**

**در بند چیزی نبودن:** گوێ بۆ شتێ شل نەبوون؛ گوێ پێ نەدان؛ دەربایستی شتێ نەهاتن ‹کفش خوب می‌خواهم و در بند پولش نیستم: کەوشێکی باشم دەوێ و گوێم بو پارەکەی شل نیە›.

در بند کردن ☜ **بەبندکشیدن**

**ـ بند**[2]**:** *پیوازه.* ـ بەن؛ ـ بەند؛ ـ وەن؛ ـ وەند؛ ـ ڤەن؛ ـ ڤەند: ١. شیاوی بەستن و هەڵاوەسین بە شتێکەوە ‹گردن‌بند: گەردن‌بەن› ٢. ـ بەس؛ ـ وەس؛ ـ بین؛ ئامرازی بەستن و داپۆشاندن ‹دهان‌بند: دەم‌بەن› ٣. هۆکار یان هۆی بەستن ‹بسته‌بند: بەسەبەن› ٤. بەسراو؛ بینیا ‹پابند:

پابەن›.

**بنداب** / bandāb، ـها/:اسم. لەند؛ قوتکی نێوان کەند و چۆمان، پێکهاتوو لە ماسە و بەرد.

**ـ بندان:** پیواژه. ـ بەندان؛ ـ بەنان: ١. بەند و باوی تێهەڵسوونی شتێک ‹حنابندان: خەنەبەندان› ٢. ڕازاندنەوەی شتێک ‹آیینەبندان: ئاوێنەبەندان› ٣. کار و ڕەوتی بەستن یان بەسران ‹راەبندان: ڕێبەندان›.

**بندانداز** / bandandāz، ـها/:اسم. ڕوومەتگیر؛ ئەو ژنەی کە گەنەمووی ڕوومەتی ژنان بەن دەخا. هەروەها: **بنداندازی**

**بندباز** / bandbāz، ـها؛ ـان/:اسم. تەنافباز؛ کەسێ کە بە سەر بەنەوە کایە دەکا و شانۆ دەگێڕێ.

**بندبازی** / bandbāzî، ـها/:اسم. تەنافبازی؛ هەرکام لەو شانۆیانە کە بە سەر تەناف (گوریس، ڕێسمان یان سیرمەوە) دەکرێن. هەروەها: **بندبازی کردن**

**بند ـ بند** / bandband/: صفت. بەندبەند؛ بەنبەن؛ وەندوەند؛ بە بەند یان بە شێوەی بەنگەلی پێکەوە لکاو.

**بندپا** / bandpā، ـها؛ ـیان/: صفت. [جانورشناسی] گەپا؛ گەپێ؛ گەهپا؛ گەهەپا؛ پێوەندیدار یان سەر بە چینی بەنپێیان، وەک مێرووله و قوڵانچە و جاڵجاڵووکە و هەزارپێ و...

**بندر** / bandar، ـها؛ بنادر/:اسم. بەندەر: ١. شار یان شارۆکەی سەر دەریا ٢. لەنگەرگا؛ ئەسکەلە؛ شوێنی پاڵگرتنی گەمیە.

▣ **بندر آزاد:** بەندەری ئازاد؛ بەندەرێ کە لەوێوە شتومەکی بازرگانی بە بێ‌مزی گۆمرۆکی دەنێرن یان وەردەگرن.

**بندرگاه** / bandargāh، ـها/:اسم. بەندەرگا؛ بەندەرگە؛ دامەزراوەیێک لە ڕەخی ئاودا بۆ بارکردن یان بار داگرتن.

**بندری** / bandarî/: صفت. بەندەری: ١. سەبارەت بە بەندەر ‹کالای بندری: شتومەکی بەندەری› ٢. بە تایبەتیگەلی بەندەرەوە ‹شهر بندری: شاری بەندەری›.

**بندزنی** / bandzanî، ـها/:اسم. گاوکەری؛ گاوکاری؛ جەرزیەکاری؛ کاری لکاندنەوە؛ پێکەوە نووساندنەوەی کوتەکوتەی شتی شکاو ‹چینی بندزنی: چینی لکاندنەوە›. هەروەها: **بندزن**

**بندفنگ** / bandfang/:اسم. [نظامی] لۆری ڕاگرتنی چەک بە چەشنێ کە بەنەکەی بکەوێتە ڕووی شانی چەپەوە.

**بندکشی** / bandkešî، ـها/:اسم. بەنکێشی؛ پڕکردنەوەی نێوانی ئاجۆرگەلی دیوار. هەروەها: **بندکش**

**بندگی** / bandegî، ـها/:اسم. کۆیلەیی؛ کۆیلەتی؛ بەنەیی؛ وەنەیی؛ لێزیەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کۆیلە بوون.

▣ **بندگی کردن:** کۆیلەیی کردن؛ وەک کۆیلە فرمان بردن.

**بندوبساط** / band-o-basāt، ـها/: [فارسی/عربی]/اسم. [گفتاری] کەلوپەل؛ شتومەک؛ بەنوپسات ‹پاسبان آمد و بند و بساط روزنامەفروش را جمع کرد و برد: پاسەوان هات و کەلوپەلی ڕۆژنامەفرۆشەکەی کۆکردەوە و بردی›.

**بندوبست** / band-o-bast، ـها/:اسم. کاکە و براله؛ خرتیوپرتی؛ خلێنەوبلێنە؛ ڕاوێژی دوو یان چەند کەس، زیاتر بۆ کارێکی ناڕەوا یان بەدەست هێنانی قازانجی نابەجێ ‹بندوبست خود را کردەاند: کاکەوبرالەی خۆیان کردووە›.

**بندوبستچی** / band-o-bastčî، ـها/: [فارسی/

ترکی] *صفت.* ساختەچی؛ فێڵباز؛ فریوکار؛ ئاوانتەچی.

**بندوران** / bandvarān/: *اسم.*

**بنده**[1] / bande، ـها؛ ـگان/: *اسم.* ١. *[قدیمی]* کۆیلە؛ بەندە؛ بەردە؛ عەبد ٢. *[مجازی]* نۆکەر؛ خزمەتکار ٣. بەندە؛ بەنە؛ وەنە؛ بەنی؛ ئافرێنراو ‹بندەی خدا: بەندەی خوا›.

▣ **بندەی خدا**: بەندەی خودا؛ بەنەخوا: ١. ئافرێنراوی خودا ٢. *[کنایی]* کەس؛ بنیادەم ‹یک بندەی خدایی آمده بود: بەنەخوایەک هاتبوو›.

**بنده**[2]: ضمیر. ئەمن؛ ئەم؛ ئەز؛ من؛ بەنە (لە وتوویژی ڕێزدارانەدا).

**بندەزاده** / bandezāde، ـها؛ ـگان/: *اسم.* کوڕی من؛ کوڕم (لە وتوویژی بەڕێزانەدا).

**بندەمنزل** / bandemanzel/: [فارسی/ عربی] *اسم.* ماڵەمن؛ ماڵی من؛ یانەو من؛ خانووی من (لە وتویژی بەڕێزانەدا).

**بندەنوازی** / bandenavāzî، ـها/: *اسم.* دلۆڤانی؛ میهرەبانی لەگەڵ ژێردەست.

هەروەها: **بندەنواز**

**بندی**[1] / bandî، ـها؛ ـان/: *اسم.* *[ادبی]* بەندی؛ دیل؛ زیندانی؛ وەنی؛ دۆساخ؛ گراو ‹بسی بندە و بندی آزاد کرد: زۆرێکی بەردە و بەندی ئازادکرد›.

**ـ بندی**[2]: *پیوازه.* ١. ـ بەندی؛ ـ بەنی؛ بڕیار لە سەر دان؛ دانان ‹سهمیەبندی: بەشبەندی› ٢. ـــ چنی؛ـــ داڕێژی؛ ڕێکوپێککری؛ دانەری ‹ردەبندی: ڕیزبەندی› ٣. ـــ بەندی؛ ـگری؛ بینەی ‹آببندی: ئاوبەندی›.

**بندیل** / bandîl، ـها/: *اسم.* *[نامتداول]* بەنیل؛ بەندیل؛ بنە: ١. کوتە پارچەی بە قەد دەسرۆکێک، کە شتی تێدەنێن و گرێی دەدەن ٢. ئاوا پارچەیەک بە ناواخنیەوە؛ تۆشۆرە؛ تۆشەرە؛ تۆشەوەرە؛ تۆشەبەرە.

**بندینک** / bandînak، ـها/: *اسم.* *[خیاطی]* ئاڵقەئاسای گیردەری کەمەربەند بە لیباسەوە.

**بنرست** / bonrost، ـها/: *صفت.* *[گیاەشناسی]* بنچک؛ بنەوەڕسا؛ ڕواو لە ڕەگ و پنجی گیاوە بە سەر زەویدا (وەک لاسکی خزۆکی تووەفەرەنگی).

**بنزین** / benzîn/: [فرانسوی] *اسم.* بەنزین؛ بەرهەمێکی نەوتە کە تراوێکی بێڕەنگ و زۆر خۆشگرە و سووتەمەنیەکی هەڵبژاردە بۆ زۆربەی موتۆرانە.

▣ **بنزین مصنوعی**: بەنزینی بەرهەمهاتوو لە بەردە خەڵووز.

**بنشن** / bonšan، ـها/: *اسم.* هیش؛ وشکە؛ وشکەدان؛ وردەدان؛ درکەدوو؛ پەتڵە؛ دانەوێڵە جگە لە گەنم و جۆ؛ ئازووقەی (بەتایبەت دانەوێڵە) هەڵگیراو لە ماڵدا.

**بنصر** / benser/: [عربی] ☜ انگشت حلقە، **انگشت**

**بنفش**[1] / banafš/: *اسم.* بەنەوش؛ بنەوش؛ وەنەوش؛ مۆ؛ تێکەڵاوی سوور و ئاوی؛ ڕەنگی خوارووی پەلکەزێڕینە.

**بنفش**[2]: *صفت.* بەنەوش؛ وەنەوش؛ وەنەوشەیی؛ بە ڕەنگی بەنەوش ‹پیراهن بنفش: کراسی بەنەوش›.

**بنفشه** / banafše/: *اسم.* وەنەوشە؛ بنەوشە؛ بەنەوشە؛ وەنەوش؛ مەنەوەشە؛ بنەفش؛ نەڤش؛ بەناوشە؛ مۆر.

▣ **بنفشەی عطری**: وەنەوشە بۆنخۆشە؛ وەنەوشەی بۆندار.

**بنفشەی فرنگی**: وەنەوشە فەرەنگی.

**بنفشەزار** / banafšezār، ـها؛ ـان/: *اسم.* وەنەوشەجاڕ؛ وەنەوشەلان؛ زەویەک کە تێیدا پنجکی زۆر لە بەنەوشە ڕواون.

**بنکدار** / bankdār, bonak-، ـها؛ ـان/: *اسم.* بنەکدار؛ عومدەفرۆشی؛ فرۆشیارێک کە

شتومەک لە بەرهەمهێنەرەوە یان هاوردەکارەوە دەکڕێ و بە دووکانگەلدا بڵاوی دەکاتەوە و دەیفرۆشێ: **عُمده‌فروش**

**بنکداری** / bankdārî, bonak- /: /اسم. بنەکداری؛ عومدەفرۆشی: ١. پیشەی بنەکدار ‹در بازار بنکداری می‌کند: لە بازاردا بنەکداری دەکات› ٢. /ـها/ شوێنی کاری بنەکدار ‹از بنکداری خریدم: لە بنەکداریدا کریم›.

**بنگ** / bang /: [سنسکریت] /اسم. بەنگ؛ چەرس؛ حەشیشە؛ هەشیش؛ گیایەکە دەیکێشن و پێ‌گێژ و سەرخۆش دەبن.

**بنگاب** / bangāb /: [سنسکریت/ فارسی] ☜ دوغ بنگ، **دوغ**

**بنگالی** / bangālî /: /اسم. بەنگالی؛ زمانی خەڵکی بەنگاڵ و بەنگلادیش؛ لە زمانەکانی هێندو ئێرانی.

**بنگاه** / bongāh، ـها /: /اسم. بنکە؛ نووسینگە؛ نقیسنگە: ١. دامەزراوە؛ جێیەک کە تێیدا کار و بارێکی دیاریکراو بە مەبەستی بارەچە یان ڕاژەدانێکی دەست نیشان کراو جێبەجێ دەکرێ ‹بنگاه‌راه‌آهن: بنکەی هێڵی‌ئاسن›: **مؤسسه** ٢. نووسینگە یان دووکانی دەلالی.

▣ **بنگاه آمارگیری**: بنکەی ژمێرکۆیی؛ دامەزراوەیەک لە وڵاتانی پێشکەوتوودا کە کاری پرسیارکردن لە خەڵکە لە بارەی هەر شتێکەوە کە باوی ڕۆژ بێ.

**بنگاه خیریه**: بنکەی چاکەکاری؛ دامەزراوەیێک کە کاری یارمەتی دانی هەژاران و بێ‌ئەنوایانە.

**بنگاه شادمانی**: بنکەی شادمانی؛ دامەزراوەیێک کە کۆڕی بەزم و شادی ڕێک دەخا و مز وەردەگرێ.

**بنگاهی** / bongāhi، ـها /: /اسم. [گفتاری] بنگادار؛ بنکەوان؛ بنکەدار؛ کارگێڕ یان بەرپرسی بنکە ‹بنگاهی چند خانه را نشانمان داد: بنکادارەکە چەند ماڵی پیشاندایین›.

**بنگدانه** / bangdāne، ـها /: [سنسکریت/ فارسی] /اسم. خەربەنگ؛ هەربەنگ؛ خەروەنگ؛ بنەگیایەکی دووساڵەیە گەڵاپان و گوڵزەرد کە بۆ دەرمان ئەشێ.

**بنگلک** / bongolak /: /اسم. وەنەتەق؛ وەنەتەقی؛ قەزوان؛ قەسوان؛ قەزقەوان؛ قەزخوان؛ قەزکەوان؛ قەسخوان؛ قسقەوان؛ بەری دارەبەن.

**بنگی** / bangî، ـها؛ ـان /: [سنسکریت] *صفت.* بەنگی؛ بەنگ‌کێش؛ وەنسە بە بەنگەوە.

**بنلاد** / bonlād، ـها /: /اسم. *[ادبی]* بنچینە؛ بناخە؛ بناغە؛ بنەما؛ بناوان؛ بنەڕەت: ١. بنەڕەتی دیوار؛ پای دیوار. بەرانبەر: **سَرلاد** ٢. *[نامتداول]* بنی‌ماڵ؛ بنەوا؛ شەنگستە؛ بنەڕەتی ماڵ.

**بنه** / bene، ـها /: /اسم. وەن؛ وەنەمشک؛ وەنەمشک؛ وەنەمشکی؛ بنەوەشیلە؛ وەنەوش؛ کولەنگ؛ کولینگ؛ وەناوشەک: ١. وەنی؛ دارەوەن؛ دارەبەن ٢. وەنەتەق؛ قەزوان؛ قەزکەوان؛ قەزقەوان؛ قەسخەوان؛ قسقەوان؛ دارکەسکانی؛ وەنەتەقی؛ بەری دار وەن: **پسته‌ی کوهی** ✻ **چاتلانقوش**

**بنه** / bone، ـها /: /اسم. بنە: ١. تۆشە؛ بژیوی سەفەر ‹باروبنه: باروبنە› ٢. بن؛ سەمک؛ شتومەک؛ ئەسپاب و ئامرازی ناوماڵ ‹بنه‌کن شدن: بن‌بڕ بوون›.

**بنه‌پا** / bonepā، ـها؛ ـیان /: /اسم. بنەوان؛ چاودێری شتومەک.

**بنه‌کن** / bonekan /: *صفت.* بنەبڕ؛ بن‌بڕ؛ ڕیشەکەن؛ لەبن‌هاتوو.

▣ **بنه‌کن شدن**: هەڵبڕان؛ هەڵکنیان؛ هەلکەنیان؛ بنەکەن بوون؛ بنەبڕ بیەی؛

بــە خاوخێزانــەوە لــە شــوێنێکەوە چــوون.
هەروەها: **بنەکن کردن**

**بنیــاد** / bonyād، ـهــا/:اسـم. ۱. [نامتـداول] بنــەڕەت؛ بنیــا؛ بنیــات؛ بنیــای؛ خــیم؛ هــیم؛ پــەی؛ بــەشــی ژێــرووی خــانوو کــە قورســایی مالی بــە ســەرەوەیــە ۲. ســەرەتــا؛ بناغــە؛ بــن؛ ڕستی؛ پێزە؛ پێز؛ سەرەتــای پــەیدا بــوونی هــەر شــتێک ۳. دامــەزراوەیــەک کــە لــە بارەچەی خۆی یــان یارمــەتی دیتــران بــەڕێوە دەچێ.

⊡ **بنیاد گذاشتن**: ۱. بنیــات‌نــان؛ بنــەڕەت‌نــان ۲. دامەزراندن؛ خستنە ڕێ ۳. باوکردن.

**بنیادگــــذاری** / bonyādgozārî:/اســـم. بنیاتنەری؛ بناخــەدارێــژی؛ بنچینــەچــنی؛ کــار یــان ڕەوتی بناغــەنیــان؛ بونیادنــان؛ بناخــە دانــان؛ بنــەڕەت مــەرزنــایرە؛ بــەدیهێنــانی دامــەزراوە یــان بنکــەیــەک. هــەروەهــا: **بنیادگذار**

**بنیــادگرا** / bonyādgerā، ـهــا؛ ـیــان/: صفت. بنــەمــاخواز؛ هــۆگر یــان شــوێن‌کــەوتــووی بنەماخوازی: **اصول‌گرا**

**بنیـــــادگرایی** / bonyādgerāyî:/اســـم. بنــەمــاخوازی؛ بــڕوا بــە پێویــست بــوونی ئاڵووێری بنەمایی لە کاربــەنــد یــا کــار و بــازدا: **اصول‌گرایی**

**بنـــی‌آدم** / banî'ādam/: [عربـی/ معـرب]/اسـم. مرۆڤ؛ مــرۆ؛ بــەشــەر؛ بنیــادەم؛ ئایــەم ‹بنی‌آدم اعـضای یــک پیکرنــد: مــرۆڤ ئــەندامگــەلی تاقــە لەشێکن›.

**بنیـــادی** / bonyādî/: صــفت. بناخـــەیـــی؛ بنەڕەتی؛ بنەمــایی؛ بنچیــرەیــی: ۱. ســەبــارەت بــە بنــەمــا و ڕیــشەی شــتێکەوە ‹دگرگــونی بنیــادی: ئاڵــوگۆڕی بناخــەیــی› ۲. گرینــگ بــۆ بــەدیهــاتنی شــتێک ‹کارهــای بنیــادی: کارگــەلی بنەڕەتی›.

**بنیــان** / bonyān، ـهــا/: [عربـی]/اسـم. بنــەمــا؛ بنیــاد؛ پایــە؛ بنــەڕەت؛ بنیــات؛ پێــز؛ بنــڕەخ؛ پێکهاتــە یــان قالــبی ســەرەکــی کــە دەبێتــە هۆی بــەدیهــاتن یــان مانــەوەی شــتێک ‹بنیان خانواده بر محبت استوار است: بنــەمــای بنــەماڵــە لــە سەر خۆشەویستی دامەزراوە›.

**بنیــانکن** / bonyānkan/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. کــاول‌کــەر؛ وێــران‌کــەر؛ لــەناوبــەر؛ بــن‌کــۆڵ؛ بنکــەن؛ خاپوورکــەر؛ بنــەبڕ؛ فــەوتێنــەر ‹سیل بنیانکن: لافاویکاوڵکەر›.

**بنیانگــذار** / bonyāngozār، ـهــا؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. دانــەر؛ بناخــەدارێــژ؛ هــێمدانــەر؛ بناغەدانەر؛ پایــەدارێــژ؛ پایــەچــن؛ کــەســێ کــە مــاڵ، دامــەزراوە یــان کارێــک پێــک‌دێنــێ.
هەروەها: **بنیانگذاری**

**بنـی‌بـشر** / banîbašar/: [عربـی]/اسـم. مــرۆڤ؛ مرۆ؛ بنیادەم؛ بنیــام؛ ئایــەم؛ ئینــسان؛ بــەشــەر؛ جووقــەوار ‹در آنجــا هــیچ بنــی‌بــشری نبــود: دەوێــدا تاقە مروڤێک نەبوو›.

**بنـی‌نـوع** / banînow', banîno:'/: [عربـی]/اسـم. [ادبـی] هــاوجۆر؛ هــاوبیچم؛ هاوچــەشــن؛ یــەک بە یەکی گیاندارانی لە یەک جنس.

**بنیــه** / bonye، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ۱. هێــز؛ هــاز؛ تــوان؛ قــەوەت؛ گــورد؛ بڕســت؛ بڕشــت ۲. باڵاشمــە؛ باڵیــشمە؛ داری بــە درێــژادا بــڕاو بــۆ ســەر تاقــەی دیــوار کــە داریتــری بــە ســەردا ڕایەڵ دەخەن.

**بو** / bû، ـهـا/:اسـم. بــۆن؛ بــۆ؛ بــوو؛ بــوە؛ بــەون؛ بێن؛ بهن؛ بێهن؛ بــیهن: ۱. چۆنیــەتیــەک لــە شتاندا کە ئەنــدامی بــۆوەنــگ دەبزوێنــێ ‹بــوی خــوش: بــونــی خــۆش› ۲. [مجــازی] هــۆ یــان نیشانەیێکــی هــورد ‹بــوی بهــشت مــی‌آیــد: بونــی بەهەشت دێ›.

⊡ **بــو آمــدن**: ۱. بــۆن هــاتن؛ بــۆ هــاتن؛ بــۆ ئامەی ‹بــوی سوختگی مــی‌آیــد: بــۆی سووتاوی

دیٚ›. ٢. [مجازی] وادیار بوون ‹بوی دعوا می‌آید: وادیاره شەڕێکی لیٚ‌هەڵسیٚ›.

**بو بردن:** [مجازی] سۆ بردن؛ بۆن هەڵکردن؛ بۆ هۆرکەردەی؛ پەی بردن؛ هەست‌کردن بە هەبوونی شتێک ‹بو برده بود که پول دارم: بۆنی هەڵکردبوو کە پارەم هەیە›.

**بو دادن:** ١. [گفتاری] برژاندن؛ براشتن؛ بریان‌کردن؛ بۆدان؛ برێژنەی ‹تخمه را بو دادم: تۆمەکەم برژاند› ٢. بۆ هاتن؛ بۆی گەن هەبوون ‹پاهایت بو می‌دهد، برو بشور: بۆی پات دیٚ، بچۆ بیشۆرە›.

**بو کردن:** بۆکردن؛ بۆن‌کردن؛ بۆ هەڵمژین؛ بۆکەردەی ‹گُل را بو کرد: گوڵەکەی بۆن‌کرد›.

**بو کشیدن:** ١. بۆن هەڵمژین؛ مڵومۆ کردن؛ مڵومۆش‌کردن؛ میسان؛ بۆن هەڵکردن؛ بۆ هۆرکێشەی؛ بۆ هۆرلووشتەی ٢. [مجازی] کنەکردن؛ چەکەچنەکەردەی؛ شوێنی شتێک گرتن.

**بو گرفتن:** بۆکردن؛ گنخان؛ بۆن‌گرتن؛ بۆ گیٚرتەی؛ بۆنی ناخۆش لیٚ پەیدا بوون ‹غذا مانده و بو گرفته: چێشتەکە ماوەتەوە و بۆی کردووە›.

**بوی الرحمان کسی بلند شدن/ آمدن:** [کنایی] عیزرائیل بە دەور سەر کەسێکا خولیانەوە؛ قافێز هاتنە بەرچاو کەسێک؛ لە گیانەلادا بوون: **بوی حلوای کسی بلند شدن/ آمدن**

**بوی چیزی آمدن:** ١. بۆنی شتیٚ هاتن ٢. [مجازی] هەست بە ڕوودانی شتیٚ کردن.

**بوی حلوای کسی بلند شدن/ آمدن** ☜ **بوی الرحمان کسی بلند شدن/ آمدن**

**بویی از چیزی نبردن:** [مجازی] لە شتێک بەهرە نەبردن؛ تەواو بیٚ‌بەهرە بوون لە شتیٚ ‹از انسانیّت بویی نبرده بود: هیچ بەهردیەکی لە مروڤایەتی نەبردبوو›.

**بوآ** / boā, bû'ā، ـها/: [فرانسوی/ انگلیسی]/اسم. بوا؛ بووئا؛ جۆرێک ماری زۆر گەورە: **اژدرمار؛ کورمار؛ مار بوآ**

**بواسیر** / bavāsîr/: [عربی]/اسم. بەواسیر؛ مایەسیری؛ بەوەسیری؛ باوەسیر؛ نەخۆشی پەنەمانی ڕەشەدەمارگەلی خواری ڕیٚخۆڵە و دەرپەڕینی بە دەوری نیشتنگەدا، کە زگ کارکردن دژوار دەکاتەوە و هاوڕیٚ لەگەڵ ئێش و بریٚ‌جار خوێندایە.

**بوالعجب** / bol'acab/: [از عربی] ☜ **بُلعَجَب**

**بوالفضول** / bolfozûl/: [از عربی] ☜ **بُلفُضول**

**بوالهوس** / bolhavas/: [از عربی] ☜ **بُلهَوَس**

**بوالهوسانه** / bolhavasāne/: [از عربی/ فارسی] ☜ **بُلهَوَسانه**

**بوالهوسی** / bolhavasî/: [از عربی] ☜ **بُلهَوَسی**

**بوئر** / bo'er، ـها/:/اسم. بۆئێر؛ هەر یەک لە دانیشتوانی ڕەگەز هۆڵەندی ئافریقای باشووری کە بە زوانی ئافریکان قسە دەکەن.

**بوئیدن** / bû'îdan/ ☜ **بوییدن**

**بوبرنگ** / bûbarang/:/اسم. [گفتاری] بۆن و بەرامە؛ بەرام؛ بۆنی خۆش ‹این چای هیچ بوبرنگی ندارد: ئەم چاییە بۆن و بەرامەیەکی وای نیە›.

**بوبین** / bobîn, bûbîn، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ١. کاژ؛ لوولک؛ قرقرە؛ قرقرە؛ غەرغەرە؛ غەرغەرە؛ قەنەک؛ بەکرە؛ مەکارە؛ لا؛ گەرگەرە؛ خرخرە؛ کاج؛ چەرخەک؛ تەشیلە؛ دارتوون؛ چرپ؛ خرووکەی لە چیٚو یان پەلاستیک کە بەنی بە دەوردا هەڵدەکریٚ ٢. شەپۆپە؛ مەکۆ؛ کلافە؛

مەکۆک؛ خلووکە؛ لوولەی ئەستووری خوار ماشینی بەنڕێسی کە ڕێسراوەکە بە دەوریدا کۆ دەبێتەوە.

**بوتان** / bûtān/: [فرانسوی]/اسم. بووتان؛ گازی بێ ڕەنگ و بۆی هاوڕێ لەگەڵ نەوت لە ژێر زەویدا، کە بۆ سووتەمەنی باشترین گازە.

**بوتولیسم** / botolîsm/: [فرانسوی] ☜ **بُتولیسم**

**بوتە** / bûte/:/اسم. ١. /ها/ پنچک؛ کان؛ پنجەگیا؛ پنجاڕ؛ بنجگ؛ بنەگیا؛ پنچکەگیا؛ پنج؛ لەم؛ تەپکە؛ بنجە؛ قولانجە؛ بڕک؛ بتە؛ دەوەن؛ منج؛ پنجیبێستان ٢. /ها//صنعت/ کوورە؛ جێ تاواندنەوەی کانزا ٣. /مجازی/ گێژاو؛ گێژەلووکە؛ ڕەوتێکی درێژخایەن و ئاستەم ‹بوتەی آزمایش: گێژاوی ئەزموون›.

**بوتیک** / bûtîk، ها/: [فرانسوی]/اسم. جلوبەرگفرۆشی؛ گنجفرۆشی؛ دووکانێ کە تێیدا جل و بەرگ دەفرۆشن.

**بوتیکدار** / bûtîkdār، ها؛ ان/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. جلوبەرگفرۆش؛ گنجفرۆش؛ کەسێ کە دووکانی جل و بەرگ فرۆتنی هەیە.

**بوتیمار** / bûtîmār، ها؛ ان/: [از عربی/ فارسی] /اسم. خەمخۆرە؛ مشورخۆرە؛ شاهۆ؛ شینەشاهۆ؛ شاوەشینکە؛ شاوە؛ شاڤاشین؛ شاڤەشین؛ شاڤ؛ واق؛ بۆتیمار؛ ویرغال؛ چرک؛ مەلوو؛ باڵدارێکی گەورەی مل و قاچ درێژە هەر لە ئاوان دەبێ، لە لێلایی بەیانی و ئێواران دەخوێنی و دەنگی وەکوو هەنیسکەی گریان وایە.

**بوجار** / bûcār، ها/:/اسم. بووجاڕ؛ بەوەجاڕ؛ تەتەڵەکار؛ لەنگەریکار؛ کۆسەکار؛ کەسێ کە کاری پاککردنی گەنم و دانەوێڵەیە.

▣ **بوجار لنجان**: /کنایی/ هۆکیـهۆکی؛ دەمدەمی؛ وازیـوازی؛ وازوازی؛ حولحولی؛ تاوتاوی؛ عەنتەرمەزاج؛ هەرتاوێ لە سەر بڕیارێ.

**بوجاری** / bûcārî، ها/:/اسم. قەتا؛ تەتەڵە؛ تەتەڵەکەری؛ لەنگەری؛ کۆسەکاری؛ شەنوکەو؛ شەن و کەوەن؛ کاری خاوێن کردنەوەی دەخڵ.

**ـ بود** / bûd/: پیواژە. ـ بوو؛ ـ هەبوو؛ ـ بێ؛ بوون ‹کمبود؛ بهبود: کەمبوو؛ باشبوو›.

**بود** / bovad/: فعل. /ادبی/ دەبێ؛ ئەبێ؛ ببێ؛ بۆ؛ مەبۆ؛ سەر بە سێهەم کەسی تاک لە کرداری ڕانەبردووی هەبوون ‹توانا بود هر کە دانا بود: کە زانا بوو بێشک توانا دەبێ›.

**بودائی** / bûdā'î/: [سنسکریت] ☜ **بودایی**

**بودائیت** / bûdā'îyyat/: [سنسکریت/ عربی] /اسم. بوودایییەتی؛ ئایینێ کە لە سەدەی شەشی بەر لە زایین بە دەستی بوودا لە هیندوستان داڕێژرا و لە ئاسیای ناوەڕاست، ڕۆژهەلات و باشووری ئاسیادا بلاو بۆوە، لە سەر ئەم بنەمایەیە کە ڕزگاری لە کەند و لەندی ژیان لە ڕێی گەیشتن بە نووری هەتاهەتاییەوە دەس دەدا و لەو ڕێیەوە مرۆ دەتوانێ خۆی لە هاتن و چوونی بێبڕانەوەی مەرگ و ژین دەرباز کا: **دینِ بودا**

**بودادە** / bûdāde، ها/: صفت. گەرمشتە؛ برژاو؛ برژیاگ (☜ بو دادن، **بو**) ‹تخمەی بودادە: تووی گەرمشتە›.

**بودار** / bûdār، ها/: صفت. /گفتاری/ بۆندار؛ بۆدار: ١. بۆدرن؛ بوودار؛ بە بۆنی توندەوە ٢. /کنایی/ بە واتایێ کە بیسەر یا خوێنەر وای بۆ دەچێ کە لە بنەوە واتایەکی تر، دژ بە مەبەستێکی تێدایە (بۆ وتار و نووسراوە) ‹حرفهای بودار میزد: قسەی بۆنداری دەکرد›.

**بودایی**[1] / bûdāyî، ها؛ ان/: [سنسکریت]

/سم. بوودایی؛ شوێنکەوتەی ئایینی بوودا: **بودائی**

**بودایی**[2]: صفت. بوودایی؛ سەربە بوودایی؛ هەر شتێک پێوەندی بە ئایینی بووداوە هەبێ: **بودائی**

**بودجە** / bûdce، ـها/: [فرانسوی]/سم. تواز؛ بووجە؛ لەنگەر؛ سەرچاوەی پووڵ و پارە و خەرجوبەرجی پێشبینیکراو بۆ یەک بازنەی کاتی دیاریکراو.

**بودجەبندی** / bûdcebandî، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/سم. کار و ڕەوتی بووجە کردن؛ ڕێکخستنی بووجە؛ نقیسینی بووجە؛ بەراوردکردنی هەریەکە لە داهات و سەرچاوەگەلی پووڵی و هەروەها دابەش کردنیان.

**بودجەنویسی** / bûdcenevîsî/: [فرانسوی/ فارسی]/سم. کار و ڕەوتی بووجە نووسین؛ بووجە بەراوەردکردن.

**بودشناسی** / bûdšenāsî/:/سم. بوونناسی؛ هەبوونناسی؛ بیر و ڕای لە مەڕ چۆنیەتی جیهان، یان خۆ و هەبوونی بوونەوەران، بێئاوڕدانەوە لە تایبەتمەندیان ☼ **هستیشناسی**

**بودن** / bûdan/: مصدر. لازم.// **بودی**: بووی؛ **هستی**: هەی؛ **باش**: ببە// بوون؛ هەبین؛ بیەی: ١. هەبوون ‹بودن گلهای زیبا: بوونی گوڵانی جوان› ٢. لە سەر دۆخ و حاڵێ بوون ‹شاد بودن: شاد بوون› ٣. لە شوێنێکدا بوون ‹بودن کتابها در قفسه: بوونی کتێبگەل لە ڕەفەدا› ٤. ژیان بردنە سەر لە شوێنێکدا ‹بودن در شهر غریب: لە شاری نامۆدا بوون›.

هەروەها: **بودنی**

■ صفت فاعلی: **باشنده** (ــ)/ صفت مفعولی: **بوده** (بوو)/ مصدر منفی: **نَبودن** (نەبوون)

**بودونبود** / bûd-o-nabûd، ـها/:/سم. بوون و نەبوون: ١. بوو و نەبوو؛ دار و نەدار؛ هەموو ئەو شتانەی لە شوێنێک دان یان هەموو دارایی کەسێک ‹همهٔ بود و نبودش بر باد رفت: هەموو دار و نەداری فەوتا› ٢. هەبوون یا نەبوون ‹بود و نبودش برای من فرقی ندارد: بوون و نەبوونی بۆ من وەکوو یەک وایە›.

**بور** / bor/: [فرانسوی] ☜ **بُورُون**

**بور**[1] / bûr/:/سم. تەلایی؛ کاڵ؛ هول؛ ڕەنگی زەردی بریقەدار.

**بور**[2]: صفت. ١. کاڵ؛ بە ڕەنگی زەرد (زۆرتر بۆ موو) ‹موی بور: مووی زەرد› ٢. [کنایی] ڕووزەرد؛ شەرمەسار و سەرشۆڕ؛ سەرلەبەر؛ زەرد هەڵگەڕاو ‹از جواب دختر خیلی بور شد: لە وەرامی کچەکە زۆر کاڵ بووەوە›.

**بورابرش** / bûr.abraš/: [فارسی/ عربی]/سم. سورخوون؛ ئەسپی خاڵ سوور و سپی.

**بوران** / bûrān، ـها/: [ترکی]/سم. کرێوە؛ بۆران؛ باووە؛ بارۆشک؛ بادەوە؛ باکوت؛ باداوە؛ باسریشک؛ بازریشک؛ لاسامێ؛ توف؛ بارینی بەفر یان باران هاوڕێ لەگەڵ بادی توندا.

**بورانی** / bûrānî, borānî، ـها/:/سم. بۆرانی؛ بۆرەقانیێ؛ چێشتی باینجان یان سەوزیگەل لەگەڵ ئاو و ڕۆندا: **بُرانی**

**بوربور** / bûrbûr/ ☜ **زال**

**بوربوری** / bûrbûrî/ ☜ **زالی**

**بورت** / bûret، ـها/: [فرانسوی]/سم. [شیمی] بووریت؛ شووشەی نیشانەداری تراو پێوان.

**بورژوا** / bûrj(u)vā، ـها/: [فرانسوی]/سم. بورژوا؛ ئەندامی چینی بورژوازی.

**بورژوائی** / bûrj(u)vā'î/: [فرانسوی] ☜ **بورژوایی**

**بورژوازی** / bûrj(u)vāzî/: [فرانسوی]/سم. بورژوازی؛ لە کۆمەڵگای سەرمایەداریدا بەو شارنشینانە دەڵێن کە ئامێری بەرهەم

هێنان و سەرمایەیان بە دەستە.

▣ بـورژوازی تجـاری: بـورژوازی بازرگـانی؛ بازرگانان؛ تیپ و تاقمی تاجران.

بـورژوازی صـنعتی: بـورژوازی پیـشەسـازی؛ پیشەسازان؛ دەستەی کارخانەداران.

بورژوازی کُمپرادور ☜ **بورژوازی وابسته**

بۆژوازی کوچک ☜ **خردەبورژوازی ـ١**

بـــورژوازی مـــالی: بـــورژوازی مالـــی؛ بانگـداران؛ تـاقمی کارگێـڕان بـەپـارە (بـۆ بانگ یان پارەگۆڕینەوە).

بـورژوازی ملـی: بـورژوازی نـەتـەوەیـی؛ گرۆی سەربەخۆیان.

بـورژوازی وابـسته: بـورژوازی پێـوەنـدار؛ گرۆی سەرسپاردوان: **بورژوازی کُمپرادور**

**بـورژوایی** / bûrj(u)vāyî/: [فرانـسوی] صـفت. بورژوایی؛ پێوەندیـدار یـان سـەر بـە بـورژوا یـا بورژوازیەوە: **بورژوائی**

**بـورس** / bûrs/: [فرانـسوی]/سـم. بـوورس: ١. شـــوێنێک بـــۆ یـــەک دیـــتنی بازرگـانـــان و سـەنـدن و فـرۆتنی یـەک جـۆرە کووتـاڵ ٢. /ــهـا/ پـارەیـەک بـۆ کـارێکی دیـاریکراو (خوێنـــدن یـــان لێکۆڵـــینەوە و ...) دەدرێتـــە کەسێک یان دامەزراوەیەک.

▣ **بورس اوراق بهادار**: بوورسـی بـەڵـگەی بـە نرخ؛ شـوێنی کـڕین و فرۆشـتنەوەی بـەڵـگە بەنرخەکان.

**بـورس تحـــصیلی**: بوورســـی خوێنـــدن؛ بوورسی وانە خوێنـدن؛ پـارە و فـەرحانیـەک کـە دەدرێ بـە کـەسـێ کـە لـە مـاوەیێکـی دیـاریکراودا دەرسـێک بخوێنـێ یـان لـە شتێ بکۆڵێتەوە.

▣ **بورس دادن**: بـوورس دان؛ پـارە پێـدان بـۆ خوێنـــدن یـــان لێکۆڵـــێنەوە. هـــەروەهـــا: **بورس گرفتن**

تو(ی) بورس بـودن: [مجـازی] بـاو بـوون؛ بـە برەو بوون؛ کڕیاری زۆر هەبوون.

**بــورس‌بــازی** / bûrsbāzî/، ـهــا/: [فرانــسوی/ فارســی]/ســم. بــوورس‌بــازی؛ گــران‌کــردنی شتێک بەهـۆی کاکـەوبرالـەی چـەنـد بازرگـان پێکەوە.

**بورســـیه** / bûrsiye/، ـهــا/: [فرانــسوی]/ســم. بـوورس‌بـەر؛ ڕاتبـەگـر؛ کـەسـێ کـە بوورسـی وەرگرتووە.

**بـورک** / bûrak/: /سـم. کـەڕوو؛ کـەپـەک؛ کـەفـەک؛ کـەڕەکیفـە؛ کـەڕۆڵـیە؛ بـرش؛ ئـەو تۆژاڵە ئەکەوێتە سەر شتی ترشاو.

**بــوروکرات** / bûrok(e)rāt, borokrāt/، ـهـا/: [فرانسوی] صفت. مەزرینگـەوان: ١. کـەسـێ کـە هۆگری دام و دەزگای مەزرینگەیی بـێ ٢. ئـەو کەسەی لە کار و باری مەزرینگەدا شارەزا بێ یـا خۆ کاری ئەوە بێ.

**بوروکراسـی** / bûrok(e)rāsî, borokrāsî/، ـها/: [فرانسوی]/سم. ١. [سیاست] میرمـەزرینگـەیـی ٢. کاغەزبازی؛ ڕەسم و ڕستی مەزرینگەیی.

**بـــورون** / boron/: [فرانـــسوی]/ســـم. بـــۆرۆن؛ تـــوخمی کیمیـــاوی وەک کـــانزا، بـــە ژمـــارەی ئـەتـومی ٥ و کێـشی ئـەتـومی ١٠,٨١ کـە لـە سروشتدا تەنیا بـە شـێوەی تێـکـئـاڵاو هـەیـە: **بُور؛ بُر**

**بوریـا** / bûr(i)yā/، ـهـا/: [معـرب از آرامـی]/سم. [ادبی] ١. ژاژ؛ بۆریـا؛ قـامیش؛ قـامووش؛ قـامر؛ قـەڕەم؛ گیایـەکـە لـە جـۆرەکـانی نـەی، لـە تـیرەی گـەنمـی، بـە لقـی بـەرز و کولـکن و گوڵـی وەنـەوش و بـڕێ جـاریش زەرد کـە لـە قۆتـەکـەیـف جلـی ژێـر دەسـەچینـە و شتومەکی‌تر دەچـنن ٢. هـەسیر؛ حـەسیر؛ باریە؛ چیغ؛ ڕایەخی لە جەگەن و قامیش.

▣ **بوریای رسمی**: زەل؛ پێکـە؛ لیـک؛ لـەقـەن؛ چیت؛ چیتـک؛ قـامیش‌زەل؛ تـەرکـە؛ نـەی؛ لەیلک.

**بــوزدایی** / bûzedāyî، ـهـا/: *اسم.* بۆکـوژی؛ لەناو بردنی بۆنی پیس.
**بوزینـه** / bûzîne، ـهـا؛ ـگـان/: *اسم. [ادبی]* ۱. مەمینه؛ عەنتەر؛ حـەنتـەر؛ مـەیمـوون؛ بووزنـە؛ بووزینه ۲. مەیمووونی بەجووجک.
**بوس** [1] / bûs/: *اسم. [مخفف]* مـاچ؛ ماچـه؛ پـاچ؛ ڕامـــــووس؛ ڕامـــــووز؛ مـــــیس؛ ڕامـــــیس؛ ڕامووسانک.
▣ **بــوس دادن:** *[گفتـاری]* مــاچ دان؛ مـــاچ پێدان؛ ڕێدان بـەوەی کـه کـەسێک ماچـت بکاتـەوه ‹بیـا بـه عمـو بـوس بـده: وەره ماچێـک بدەره مامەی خۆت›.
**بــوس کـــردن:** *[گفتـاری]* مـــاچ کـــردن؛ ڕامووسان؛ ڕامووسین.
**ــــ بــوس** [2]: *پـــیواژه.* ــ ڕامـــووس؛ــ ماچکــەر ‹دستبوس: دەس‌ڕامووس›.
**بوستان** / bûstān، ـهـا/: *اسم.* بۆسـان؛ بێـستان؛ بێسان؛ شـینایی؛ باخچـه: ۱. تـەڕەکـاڵ؛ کیـار؛ بێـــستانی چانـــدنی مێـــوه (وەک شـــووتی، کاڵــەک، زرک و ...) ۲. *[ادبـی]* بـــاخی گـــوڵ و گیـــا ۳. باخچـــەی گـــشتی؛ باخچـــەی حەسانەوه و پیاسه ❋ **بُستان**
**بوسـلیک** / bûsalîk/: [از عربـی] *اسم. [موسـیقی]* بووسەلیک؛ گۆشـەیـەک لـه دەزگـای نـەوا لـه مووسیقای ئێرانیدا.
**بــوس و کنــار** / bûs-o-kenār/: *اسـم. [ادبـی]* مـاچ و مـووچ؛ کـاری مـاچ‌کـردن و لـه ئـامێز گـرتن؛ ڕامووسانی یـەکتـر ‹دیـدار شـد مُیسّر و بوس و کنار هم: چـاو بـه یـەک‌کـەوتـن دەسـی‌دا و ماچ و مووچیش هەروەها›.
**بوســه** / bûse، ـهـا/: *اسـم.* مـاچ؛ ماچـه؛ پـاچ؛ ڕامـووس؛ ڕامـووز؛ ڕامـیس؛ مـووس؛ مـووچ؛ مۆچ؛ میس؛ ڕامووسانک.
▣ **بوســه دادن:** *[ادبـی]* ۱. مـاچ دان؛ بـەرایـی دان بـۆ ڕامووسـان ‹بوسـه‌ای زان لـب چـون قند بـده: مـاچیکم بـده لـەو لێـوه قـەنـده› ۲. مـاچ کـردن؛ ڕامووسـین؛ ڕامووسـان ‹از اسب فـرود آمد و بر رکاب او بوسه داد: لـه ئـەسـپ دابـەزی و ئاوزینگی ڕامووسی›.
**بوســه زدن:** *[ادبـی]* ڕامووســین؛ ڕامووســان؛ مــاچ‌کــردن ‹از دور بوســه بــر رخ مهتــاب مــی‌زدم: ڕووی مانگەشەوم له دوورەوه ماچ دەکرد›.
**بوســه فرســتادن:** مــاچ نــاردن؛ لێــو غونچــه کردن و به دەس ئاماژەکردن.
**بوسه گرفتن:** *[ادبی]* مـاچ لـێ‌سـەنـدن؛ مـاچ کردن.
**ـ بوسی** / bûsî/: *پیواژه.* ـ ڕامووسی؛ مـاچ‌کـردن؛ ڕامووسین ‹دستبوسی: دەست ڕامووسی›.
**بوســـــیدن** / bûsîdan/: *مـــــصدر. متعـــــدی.* //**بوســیدی:** ڕاتمووســی؛ **مــی‌بوســی:** ڕادەمووســی؛ **ببــوس:** ڕامووســه// ڕامووســـان؛ ڕامووســـین؛ میسان؛ ماچ‌کردن؛ مـۆچ کـردن؛ مـاچ‌کـەردەی؛ پاچ‌کردن؛ پاچکرن؛ لەوپادایش.
■ صـفت فـاعلی: **بوســـنده** (ڕامووســـەر)/ صـفت مفعـولی: **بوســـیده** (ڕامووســراو)/ مـصدر منفـی: **نَبوسیدن** (ڕانەمووسان)
**بـــوش** / bûš، ـهـا/: [فرانـسوی] *اسـم. [صـنعت]* بـــووش؛ شــتێکی وەرســووڕ یــان وەســتاو بــه بیچمــی یاتاقــان یــان ئاڵــقه کــه میلــه یــان تەوەرەی دەنێودا دەخولێتەوه.
**بوشــــــمن** / bûšman/: *اســـم.* بووشمـــــەن؛ خـــەڵـــکی باشـــووری ئـــەفریقـــا لـــه زمـــانی ئوروپاییاندا ☜ **سان**
**بوشـن** / bûšan، ـهـا/: [فرانـسوی] *اسـم. [صـنعت]* بووشەن؛ کوتـەلوولـەی دوو سـەر ڕزوەکـراو بـۆ لکاندنی دوو لووله پێکەوه.
**بــوف** / bûf، ـهـا؛ ـان/: *اسـم. [ادبـی]* بـووم؛ بـوم؛ بـــوو؛ کونـــد؛ کونـــدەبـــووم؛ کونـــدەبـــوو؛ کوندەبوومـه؛ کونـدەبـەبـوو؛ پـەپـوو؛ پـەپـۆک؛ پـــەپوویـــک؛ بایـــەقـــوش؛ مونـــد؛ تـــۆت؛

کەلکەلەوانی.

◙ بـوف بـزرگ: شـابوو؛ کونـدی زل؛ بـوومی زل: **شاەبوف**

بـوف سـفید: کونـدەبـووی سـپی: **بـوف سفیدبرفی**

بوف سفیدبرفی ☜ **بوف‌سفید**

**بوفـالو** / bûfālo. ـهـا/: [انگلیـسی/ فرانـسوی]/اسـم. بووفالۆ؛ گامێشی ئەمریکی: **بافالو**

**بوفـه** / bûfe. ـهـا/: [فرانـسوی]/اسـم. ۱. هـۆدە؛ یانه ۲. چایخانە؛ قاوەخانە.

**بـوق** / bûq. ـهـا/: [معـرب از لاتینی]/اسـم. بـۆق: ۱. شـووت؛ ئـامرازی هـەنـاردنی دەنگێـک بـۆ ئاگـادارکردن ۲. *[قـدیمی]* جـۆرێ سـازی بـایی وەکـوو شـاخی حـەیـوان کـە دەنگێکـی گـڕ و بەرزی هەبوو.

◙ بـوق سـگ: *[مجـازی]* نیـوەشـەو؛ شـەوی دێـروەخـت؛ درەنگانـەی شـەو؛ شـەو درەنگان؛ بەرلە پارشێو.

◘ بـوق زدن: بـۆق‌لێـدان؛ دەرهێنـانی دەنگـی بۆق.

توی بوق گذاشتن/ کـردن: *[کنایی]* هـەلالـە کردن؛ جاڕدان؛ بـەقـەو هـەراکـردن؛ هـەرا و هوریـاکردن؛ هۆگالـێ وسـەی ڕا؛ دەی دۆڵەرە؛ هەرا و مەزات ڕێخستن.

**بوقلمـون** / bûqalamûn. ـهـا/: [معـرب از یونـانی]/اسـم. بۆقلـە؛ بووقلـە؛ بـەقلـەمـووت؛ قەلەموون؛ قـەلـەموونـە؛ بـەقلـە؛ بووقلـەمـوون؛ قـەل؛ عـەلـەشـیش؛ عـەلووعـەلـۆ؛ عـەلـۆک؛ گزگـل؛ مـامرەشـامی؛ مارگیـسە؛ کـەڕگامیـسری؛ بالـندەیێکـە دووئـەوەنـدەی مریشک دەبێ، پەڕی چـەتـری و ڕەنگاوڕەنگـە و زۆرتر بۆ گۆشتەکەی ڕایدەگرن.

**بـوقی** / bûqî/: [معـرب] صفت. بـۆقی؛ شـتی وەک بۆق ‹کلاه بوقی: کلاو بوقی›.

**بـوکس** / boks/: [فرانـسوی از انگلیـسی] ☜ **بُکس**

**بوکـسور** / boksor/: [فرانـسوی از انگلیـسی] ☜ **بُکسُور**

**بوکلـه** / bûkle/: [فرانـسوی]/اسـم. بوکلـە؛ جۆرێ بەنی خەملی.

**بوگنـدو** / bûgandû. ـهـا/: صـفت. *[گفتـاری]* بۆگەن؛ بۆگـەنیـو؛ کـەڤـز؛ بێگـەن؛ بـۆن‌پـیس؛ بۆدڕ؛ هەرچی بۆنی ناخۆش بدا.

**بـوگیر** / bûgîr. ـهـا/: اسـم. بۆبـرە؛ بۆچنـە؛ بۆنبـڕ؛ بـۆگیر؛ بـۆگر: ۱. مـاکێکی کـافووری بۆنخۆش کە بۆ لەناو بـردنی بـۆنی نـاخۆش بـە دیواری دەساو، حـەمـام و ...دا هـەڵـیدەواسـن ۲. هـەر مـاکێکی بۆنخـۆش کـە بـۆ لابـردنی بۆن بە کار ئەبرێت.

**بـول** / bowl, bo:l/: [عربـی]/اسـم. *[نامتـداول]* میز؛ مێز؛ گمێز.

◘ بـول کـردن: میزکـردن؛ مێزکـردن؛ گمێـز کردن.

**بولاغ‌اوتی** / bûlāq'otî, bûlāqutî/: [ترکی] ☜ **آب‌تره**

**بـولتن** / bûltan. ـهـا/: [فرانـسوی]/اسـم. مـیری؛ بلاڤۆک؛ بـەلاڤـۆک: ۱. کورتـە ڕاپـۆرتی چاپی لـە ڕووداو و هـەوالـگەلی ڕێخـراوەیێـک ۲. گۆڤـارێ کـە هـەواڵ و ڕاپورتگـەلێکـی دیاریکراوی تێدایـە و تـەنیـا لـە نێـو تـاقمێکی تایبەتدا بلاو دەبێتەوە.

**بولـداگ** / bûldāg. ـهـا/: [انگلیـسی]/اسـم. بولداگ؛ جۆرێ سەگی سەرزلی کەم‌تووک.

**بولـدوزر** / bûldozer. ـهـا/: [انگلیـسی]/اسـم. بۆلـدیزر؛ بۆلـدوزیر؛ جـۆرێ ماشـێن بـۆ دروسـت کـردنی ڕێ و پـلدانی بـەرد و تەخت‌کردنی زەوی.

**بولشویـسم** / bolševîsm/: [فرانـسوی] ☜ **بُلشویسم**

**بولشویک** / bolševîk/: [روسی] ☜ **بُلشویک**

**بولوار** / bûlvār, bolvār. ـھا/: [فرانسوی]/اسم. بلوار: ١. شەقامی پان کە لە نێویدا گوڵ و گیا هەبێ ٢. شەقامی زۆر پان و بەرین کە لە نێوانیدا سەیرانگا بێ * **بلوار**

**بولینگ** / bo:lîng. ـھا/: [انگلیسی]/اسم. بوولینگ؛ جۆرێک وەرزش کە ئەبێ بە هاویشتنی گۆیەکی قورس لە جێگای دیاریکراودا بدات لە نیشانەگەلی چێوینەوە.

**بوم** / bûm. ـھا/:/اسم. ١. [عربی] بوو؛ کوند؛ کوندەبوو؛ بایەقوش؛ بووە؛ بۆ؛ کەلکەڵەوانی ٢. نیشتمان؛ بوو؛ بووم؛ مەڵبەند؛ زێد؛ زاگە؛ جێی تێدا ژیان ٣. بووم؛ پارچەی زبری دابەستراو بە سەر چوارچێوەیێکەوە بۆ وێنەکێشان لە سەری.

**بومادران** / bûmādarān. ـھا/:/اسم. بۆژانە؛ بووژانە؛ بۆژان؛ بیژان؛ بێژەن؛ بیویژان؛ نۆویژان؛ ژابێژ؛ بیڤێژان؛ ئەنیژ؛ بۆعەترە؛ بۆگوڵە؛ بۆگلەوکەشی؛ بوومااران؛ بۆمایران؛ بووماروو؛ بۆمارانە؛ گوڵەمارانێ؛ گولەهەسێل؛ زەردە شابەنگ؛ بنەگیایەکی خۆرسکی گەلادرێژ و تووکنە بە بۆنێکی زۆر توندەوە کە بۆ دەرمان ئەشێ.

**بومرنگ** / bûmrang. ـھا/: [انگلیسی/ فرانسوی] اسم. بوومرەنگ؛ پلار؛ ئامرازێک وەکوو کەوانێکی چکۆلە و ئەستوور، کە دەیهاوێژن، دەڕوات و دێتەوە، خەڵکی دەشتەکی ئوسترالیا لە شەڕ و ڕاودا بە کاریان هێناوە و ئەمڕۆکەش ئامرازێکی وەرزشیە.

**بومسانی** / bûmsānî/:/اسم. [زیست‌شناسی] بوومسان؛ بووسانی؛ هاوڕەنگی؛ کار یان ڕەوتی هاوڕەنگ بوون لەگەڵ ئاقار یان گیاندارێکی دیکەدا.

**بومشناختی** / bûmšenāxti/: صفت. ژینگە ناسینەوە؛ بووم ناسینەوە؛ پێوەندیدار یان سەر بە بوومناسی: **محیط‌شناس**

**بومشناس** / bûmšenās. ـھا؛ ـان/:/اسم. ئاقارناس؛ ژینگەناس؛ دەژەوارناس؛ کەسێ کە دە بواری بوومناسیدا ئاگادار و بە زانستە.

**بومشناسی** / bûmšenāsî/:/اسم. ژینگەناسی؛ دەژەوارناسی؛ بوومناسی؛ ئاقارناسی؛ زاگەناسی؛ ئێکۆلۆژی؛ لقێ لە زانستی ژیوارناسی کە بە لێڕوانین و تۆژینەوەی پەیوەندی ژینەوەر لەگەڵ ئاقاری ژیانی و شێوازی ژینی هەر کام لە گیانلەبەران لە زاگەیەکدا دەپەرژێ: **محیط‌شناسی**

**بوم‌وبر** / bûm-o-bar/:/اسم. [ادبی] بەروبووم؛ نیشتمان؛ مەڵبەند؛ سەرزەوین؛ سەرزەمین؛ زاگەبەر؛ جێی تێدا ژیان.

**بومی** / bûmî. ـھا؛ ـان/: صفت. ناوخۆیی؛ خۆماڵی؛ ناوچەیی؛ زاگەیی؛ زاگەبەری؛ پێوەندیدار یان سەر بە سەرزەوینێک کە تێیدا لە دایک بووە و بارهاتووە.

▣ بومی شدن: ناوخۆیی بوون؛ خۆماڵی بوون؛ ناوچەیی بوون؛ ڕاهاتن لە شوێنی تازەدا؛ پێ‌داکەفتن. هەروەها: **بومی کردن**

**بوی** / bûy/:/اسم. [ادبی] بۆن؛ بۆ؛ بوە؛ بوو.

**بویا** / bûyā/: صفت. [نامتداول] ١. بۆندار؛ بۆدار؛ بەبۆ؛ خاوەن‌بۆ ٢. بۆنخۆش؛ خۆشبۆ؛ بەبەرامە؛ بۆوەش.

**بویائی** / bûyā'î/ ☜ **بویایی**

**بوی‌افزار** / bûyafzār/:/اسم. بۆنخۆشکەرە؛ بۆخۆشکە؛ بۆوەشی؛ شتومەکی بۆنخۆشکەری خواردەمەنی (وەکوو هێل، وانیل، هەزبۆ و...).

**بویایی** / bûyāyî/:/اسم. بێهنۆک: ١. کار یان ڕەوتی بۆن‌کردن ٢. هەستێ کە ئەندامەکەی لووتە و بۆنەکان لێک جوێ

دەکاتەوە * بویائی

**بویژه** / bevîje/: *قید.* بەتایبەت؛ بەتایبەتی؛ گەوشینی؛ نەخوازە؛ نەخوازەلا؛ نەوازە؛ نەمازە؛ خازما؛ خاسما؛ بەدانستە.

**بویناک** / bûynāk/: *صفت. [ادبی]* بۆسار؛ بۆدر؛ بۆدرِن؛ بە بۆنی تیژ و بەتایبەت ناخۆشەوە.

**بویه** / buye/ ☜ **شناوە**

**بوییدن** / bûyîdan/: *مصدر. متعدی. لازم.* //**بوییدی**: بۆنت‌کرد؛ **می‌بویی**: بۆن دەکەی؛ **بِبوی**: بۆنکە // ☐ *متعدی.* ١. بۆن‌کردن؛ بۆ کردن؛ بێهن‌کرن؛ بووکردن؛ میسان؛ بوە کەردەی؛ بۆنی شتێ هەڵمژینە ناو لووتەوە ‹گلها را بوییدن: بۆن‌کردنی گوڵ› ☐*لازم.* ٢. *[ادبی]* بەبۆن هەبوون؛ بۆ لێهاتن؛ بۆ دانەوە ‹مَشک آن است کە خود ببوید: مسک ئەوەیە کە بۆ خۆی بونی هەبێ› * **بوئیدن**. هەروەها: **بوییدنی**

■ صفت مفعولی: **بوییده** (بۆنکراو)/ مصدر منفی: **نَبوییدن** (بۆن نەکردن)

**بَه** / bah/: *صوت. [گفتاری]* بەخ؛ پەح؛ وەح؛ حەو؛ بەهـ ؛ وەهـ ؛ وشەی پەسندکردن و خۆشی ‹بە! چە اسبی بود: بەخ! چ ئەسپێک بوو›.

**به**[1] / be/: *حرف.* ١. بۆ؛ بە؛ وە؛ پەی؛ رای ‹بە خاطر تو این زحمت را می‌کشم: بو تۆ ئەم زەحمەتە دەکێشم› ٢. وە؛ بۆ؛ بەلای؛ پەی؛ بەرەو ‹بە زیر انداختن؛ بە آسمان نگریستن: وە ژێر خستن؛ بو ئاسمان نوارین› ٣. سەر؛ لە سەر؛ بە رووی ‹بە تخت نشستن: لە سەر تەخت دانیشتن› ٤. لە؛ لای؛ جە؛ ژ ‹بە بانک گذاشتن: لە بانگ دانان› ٥. بە پێی؛ بەگوێرەی؛ بە پاو ‹بە عقیدەی فارابی: بەپێی بڕوای فارابی› ٦. بە؛ لە بەرانبەر؛ لە بایی ‹بە یک شاهی نمی‌ارزد: بە شاییێک ناژێت› ٧. وە؛ بە؛ نیشانەی لەگەڵ بوون ‹بە نام خدا: وەناو خودا› ٨. وە؛ بە؛ نیشانەی سوێند خواردن ‹بە پیغمبر: بە پێغەمبەر› ٩. لە؛ بە؛ نیشانەی بەرکاری بە نێونجی (مفعول با واسطە) ‹بە پول دست نزدم؛ بە پرویز گفتم: دەستم لە پارەکە نەدا؛ بە پەرویزم گوت› ١٠. وە؛ بە؛ نیشانەی هەڵسەنگاندن ‹چهار بە یک: چوار بە یەک› ١١. بە؛ وە؛ نیشانەی پێوەندی (ربط) ‹بە کارش نمی‌رسد: بەکارەکەیدا ناگات› ١٢. بە؛ وە؛ نیشانەی خاوەن بوون ‹ملقب بە دراز دست: ناسراو بە درێژدەست› ١٣. وە؛ بە؛ نیشانەی کار یان ڕەوتێکی درێژەدار ‹بە کار افتادن: وە کار کەوتن›.

**به**[1] / beh، ـها/: *اسم.* بەی؛ بێ؛ وی؛ بەهێ؛ بهێ؛ بیهـ ؛ هێوە؛ هەیوە؛ حەیوە؛ بیوو: ١. داری بەی ٢. میوەی داری بەی.

⊡ **به ژاپنی**: بەی ژاپۆنی؛ پنجە دارێکی درکاوی بە گوڵی سوور و سپی و ڕەنگاوڕەنگ و میوەی زەرد و ترشی وەک بەیەوە.

**به ـ**[2]: *پیشوازه.* ١. تەندروست؛ ساغ؛ ساق ‹بهبود: ساغی؛ ساقی› ٢. چاکـ؛ ـ باش؛ خاسـ؛ عالـ ؛ پەسند ‹بهدین: دین‌باش›.

**بها** / bahā/: *اسم. [ادبی]* وەها؛ قیمەت؛ نرخ؛ بەها: ١. بایی؛ پارە یان کووتالێک کە بۆ بەدەس کرینی شتێک ئەدرێت ‹بهای این کتاب چقدر است؟: ئەم کتێبە بایی چەندە؟› ٢. ئەرکێک کە لە پێناوی بە دەست هێنانی شتێکدا دەکەوێتە سەرشان کەسێکەوە ‹این کار بە بهای جانش انجام شد: ئەم کارە بە قیمەت گیانی تەواو بوو› ٣. بایەخی مادی یان مەعنەوی ‹خودستایی نزد خردمندان بهایی ندارد: خۆ هەڵکێشان لە لای ژیران بێ‌نرخە›.

⊡ **بها دادن**: بەهادان؛ بایەخ دانان؛ گرینگ زانین؛ گرنگی پێدان.

**بهائم** / bahā'em/ ☜ **بهایم**

**بهائی** / bahā' î/ ☜ **بهایی**

**بهائیـت** / bahā' îyyat/: *اسم.* بـەهائییـەت؛ مەزهـەبێـک کـە حوسـێنعەلی نـووری ناسـراو بـە بـەهائولـلا (١١٩٦ــ١٢٧١ی هـەتـاوی) هێناویەتی: **بهاییگری**

**بهابازار** / bahābāzār/ ☜ **بورس**

**بهادر** / bahādor/: *صفت. [نامتداول]* پاڵـەوان؛ شەڕکەر.

**بهابرگ** / bahābarg/ ☜ **کوپن**

**بهادار** / bahādār/: *صفت.* بـەنـرخ؛ وهـادار؛ بوهـادار؛ کـۆک؛ بـەقیمـەت؛ خـاوەن بایـەخـی ئابووری.

**بهار** / bahār ـها؛ ـان/: *اسم.* بـەهـار: ١. وەهـار؛ بوهـار؛ وەهـیر؛ بـوار؛ وەسـار؛ واسـار؛ خوێنجمـان؛ یـەکێـک لـە چـوار وەرزی سـاڵ دوای زسـتان و بـەرلـە هـاوین ٢. پـشکۆژ؛ هـەلالـە؛ گۆپکـەی داری بـەردار؛ گوڵـی دارمیـوە ‹بهارنـارنج: بـەهارنـارنج› ٣. *[کنـایی]* هەڕەت؛ جەنگە؛ ئەنگۆرە؛ گـەرمـە؛ تـاف؛ تـۆف ‹بهار جوانی: بەهاری لاوەتی›.

▣ **بهار نارنج** ☜ **بهارنارنج**

**بهار آزادی** / bahāre'āzādî/: *اسم.* بـەهارئـازادی؛ دراوی زێڕ کە لە ساڵی ١٣٥٨ی هـەتاویـەوە لـە ئێراندا درووس دەکرێت (لێدەدرێت).

**بهـارات** / bahārāt/: (!) [فارسـی/ عربـی] *اسـم.* هـەزوێلـە؛ وشـکـەی گیـا و شـتی تـام و بـۆن خۆشکەری چێشت.

**بهـاران** / bahārān/: *اسم. [ادبی]* بـەهـاران؛ وەهـارانی؛ وەهـاریٚ؛ دەکـژی بـەهـاردا؛ لـە چـاخی بـەهـاردا ‹بهاران خجسته بـاد: بـەهـاران پیرۆز بێ›.

**بهاربند** / bahārband/ ☜ **باربَند ـ٣**

**بهارخواب** / bahārxāb ـها/: *اسم.* بـەهارخـەو؛ هەیوانی سەرپۆشراو کە بەشێک لە دەور و بەری ئاوەلایە.

**بهارنـارنج** / bahārnārenc ـهـا/: *اسـم.* بـەهارنـارنج: ١. پـشکوەنارنج؛ گوڵـەنـارنج؛ گوڵـی داری نـارنج کـە لـە عـەترسـازی و... بەکاردێ ٢. بەرگی سپی و ڕازاوەی بووک.

**بهـاره** / bahāre/: *صـفت.* بـەهـارۆ؛ بـەهـارە؛ وەهارە؛ وەهـاریٚ؛ بـەهـاری؛ هـەرچـی سـەربـە بەهارە ‹گندم بهاره: گەنمی بەهارە›.

▣ **بهاره کردن:** کـاری پێگـەیانـدن و گـوڵ پـێ دەرکردنی ڕووەک، بەر لە کاتی خۆی.

**بهـاری** / bahāri/: *صـفت.* بـەهـاری؛ وەهـاری؛ بوهاری؛ پەیوەندیدار بـە بـەهـارەوە ‹باد بهـاری: بای بەهاری›.

**بهاریـه** / bahārîyye/: [فارسـی/ عربـی] *اسـم.* بـەهارانـە؛ نووسـراوە بـە تایبـەت شـیعر، لـە پەسنی جوانیگەلی بەهاردا.

**بهامهر** / bahāmohr ـها/: *اسم.* ژیتۆن.

**بهانامـه** / bahānāme ـهـا/: *اسـم.* بوهانامـە؛ وهانامـە؛ ڕیـزی بـەهـای پیتـەوای دامەزراوەیێک.

**بهانـه** / bahāne ـهـا/: *اسم.* بیـانوو؛ بیانـک؛ بیانـگ؛ دەسـاوێز؛ بیـانی؛ ویانـە؛ ویـانی؛ بەهانە؛ وەهانـە؛ وەیانـە؛ بـەهانـێ؛ دەسـپیچک؛ هێجـەت؛ هـەنجـەت؛ هنجـەت؛ ئـەنجـەت؛ مسەوسک؛ کـۆک؛ پـەلـپ؛ پیلـە؛ گرنـە؛ گـرۆ؛ گەزەک؛ لام؛ پـەلـم؛ بـەلـم؛ گـروو: ١. ئـەوەی بـۆ داپۆشـینی مەبەسـت یـان چـەمکی ڕاسـتەقینە بهێنرێتـەوە ٢. عـورز؛ بۆنـە؛ مۆنەی؛ مانـەی؛ هـۆ یـان هەنگـەزەی ڕواڵـەتی کردەوەیێک.

▣ **بهانـه آوردن:** بیـانوو هێنانـەوە؛ بـەهانـە هێنـان؛ بیانـک هاوردنـەوە؛ بـەهانـێ ئـاردەیوە؛ بـڕ و بیـانوو تاشـین؛ ویـانی ئاردەیوە.

**بهانه به دست کسی افتادن:** بیـانوو کـەوتنـە

دەستی کەسێکەوە؛ بەهانە کەفتنە دەس کەسێ. هەروەها: **بهانه به دست کسی دادن**

**بهانه تراشیدن**: بەهانە هێنانەوە؛ بۆنە هێنانەوە؛ دەسپێچ تاشین؛ بیانک درووس کردن؛ گرۆ خۆش‌کردن ‹آن شب برای مادرم بهانه‌ی تراشیدم و شب به خانه نرفتم: ئەو شەوە بۆ دایکم بەهانەیەکم هێنایەوە و بۆ شەو نەچوومەوە›.

**بهانه شدن**: بوونە بیانک؛ بەبیانوو بوون ‹همین بهانه شد که نیامدم: هەر ئەمە بووە بە بیانوو کە نەهاتم›.

**بهانه کردن**: کردنە بەهانە؛ کردنە بیانک؛ بیانوو سازکردن؛ دەسپێچ‌کردن؛ کەردەی بەهانێ ‹نداشتن لباس مناسب را بهانه کرد و با ما نیامد: نەبوونی جلی باشی کردە بەهانە و نەهات لەگەڵماندا›.

**بهانه گرفتن**: بیانک‌گرتن؛ بیانووگرتن؛ بەهانەگرتن؛ بەهانێ‌گیرتەی.

**بهانه‌جو** / bahānecû، ـها؛ ـیان/: صفت. بەهانەگیر؛ بیانک‌گیر؛ بیانک‌واز؛ بەهانەدۆز؛ پیلەگیر؛ بیانووگر؛ گرنەگر؛ پەڵپ‌گر؛ گرووگر؛ بە پیلە؛ بەبەهانە؛ لەبەهانە؛ نووزن؛ کێشەکەر؛ لەچەر؛ ورکاوی؛ نقک: **بهانه‌گیر**

**بهانه‌جویی** / bahānecûyî، ـها/:اسم. بیانک‌وازی؛ پەڵپ‌پێگری؛ بەهانەگری؛ ویانی‌گیری؛ کۆک‌گری؛ گرۆگری؛ گەڕان بۆ ناتەواوییەک کە ببێتە بیانوو: **بهانه‌گیری**

**بهانه‌گیر** / bahānegîr/ ☜ **بهانه‌جو**

**بهانه‌گیری** / bahānegîrî/ ☜ **بهانه‌جویی**

**بهایم** / bahāyem/: اعربی]/اسم. چوارپێیان؛ چوارپای؛ چوارپێیانی شاخ و دەشت: **بهائم**

**بهایی** / bahāyî، ـها؛ ـان/: اعربی] صفت. بەهایی؛ سەربە بەهاییەت: **بهائی**

**بهاییگری** / bahāyîgarî/: اعربی/ فارسی]

☜ **بهائیت**

**بهبود** / behbûd/:اسم. ڕەوتی خۆشبوون: ١. خوەش بوونەوە؛ خۆش بوونەوە؛ ساغ بوونەوە؛ وەش بیەیوە؛ چاک بوونەوە لە نەخۆشی ٢. چاکتر؛ باشتر؛ خاستر؛ عالتەر؛ ڕەوتی باشتر بوون ‹وضع اقتصادی کشور پس از جنگ، بهبود یافت: باری ئابووری وڵات دوای شەڕ، خوش بوو› * **بهبودی**

**بهبودگرایی** / behbûdgerāyî/:اسم. ڕوونبینی؛ ئاموژەیێکی فەلسەفی نێوان ڕەش‌بینی و گەش‌بینی کە دەڵێ جیهان بە تێکۆشان خۆشتر دەبێت.

**بهبودی** / behbûdî/: (!) ☜ **بهبود**

**به‌به** / bahbah/: صوت. ١. بەخ؛ پەخە؛ ئوویف؛ بەه ـ بەه ؛ بەخ‌ـ بەخ؛ پەک‌چباشە؛ چجوانە؛ وەی‌ـ وەی؛ وەه ـ وەه ؛ وشەی پەسندکردن ‹بەبە چە گلی!: بەخ‌ـ بەخ چ گولێک!› ٢. وەی‌ـوەی؛ وەه ـ وەه ؛ حەی‌ـحەی؛ نیشانەی گاڵتە پێ‌کردن ‹بەبە چشمم روشن! حالا دیگر دزدی هم می‌کنی؟: حەی‌ـحەی چاوم ڕۆشن! ئیسە ئیتر دزیش ئەکەی؟›.

**بهت** / behet، ـان/: ضمیر. [گفتاری] پێت؛ بەتۆ؛ پنەت ‹دیروز بهت گفتم: دوێنێ پێتم گوت›.

**بهت** / boht/: اعربی]اسم. ١. [روان‌شناسی] ماتی؛ سڕی؛ دابەزینی ئاستی هۆشیاری و توانایی لە وەرگرتن و پێڕاگەیشتنی پەیام ٢. کاسی؛ وڕی؛ بار و دۆخی گێژی و نەبزێوی کە زۆرتر بە هۆی ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراوەوە پێک دێت.

▣ **بهت زدن**: حەپەسان؛ واقی وڕبوون؛ تەواسان؛ تەواسیەی.

**بهتان** / behetān/: ضمیر. [گفتاری] پێتان؛ بە ئێوە؛ پنەتا ‹چیزی بهتان نگفت؟: شتێکی پێتان نەگوت؟›.

**بهتـان** / bohtān، ـهـا/: [عربـی]/*اسـم.* نـەگـە؛ هـەڵـبەسـتە؛ هـەڵـبەسـت؛ بـافرۆ؛ سـاختە؛ بافیـاگ؛ دروسـکراو؛ بوختـان؛ بوختیـان؛ بوخت؛ قسەی هەڵـبەسـتە. هـەروەهـا: **بهتـان زدن**

**بهـتانگیـز** / bohtangîz/: [عربـی/ فارسـی] *صفت.* سەرسووڕێنەر؛ هەژەند: **بهتآور**

**بهتآور** / bohtāvar/ ☜ **بهتانگیز**

**بهتـر** / behtar، ـها؛ ـان/: *صفت.* باشـتر؛ چـاکتر؛ چێتر؛ قەنجتـر؛ خاسـتر؛ خاسـتەر؛ عالتـەر؛ بـە چۆنیـەتی باشـتر یـان بـە نرختـرەوە ‹زنـدگی بهتر: ژیانی باشتر›.

**بهتـرین** / behtarîn، ـهـا/: *صـفت.* باشـترین؛ چـاکترین؛ خاسـترین؛ عالتـەریـن؛ چێتـرین؛ هـۆڵئایـاک؛ سـەرتـڵ؛ سـەرگـوڵ؛ بـەرزتـرین چۆنیـەتی و باشـترین نـرخ یـان پـەسـندیەتی ‹بهترینکار: باشترین کار›.

**بهجـت** / behcat/: [عربـی]/*اسـم.* [*ادبی*] شـایی؛ شادی؛ شادمانی؛ دڵکراوەیی.

**بهجـتآور** / behcatāvar/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **بهجتانگیز**

**بهجـتاثـر** / behcat'asar/: [عربـی] *صـفت.* [*ادبی*] دڵبزوێن؛ دڵخۆشکەر؛ شادیهێن.

**بهجـتافـزا** / behcat'afzā/: [عربـی/ فارسـی] *صفت.* [*ادبی*] دڵخۆشکەر؛ دڵبزوێن.

**بهجـتانگیـز** / behcatangîz/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت.* [*ادبـی*] شـادیبەخـش؛ شـادیهێنـەر؛ دڵگەشێن: **بهجتآور**

**بـەحـق**[1] / behaq(q)/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت.* ڕاست و دروست؛ بە حـەق ‹سخنی بـەحـق بـود: قسەیەکی ڕاست و دروست بوو›: **بحق**

**بەحق**[2]: *قید.* بـەڕاسـتی؛ بـەحـەق؛ لـە بناغـەی حـەق؛ بـەدروسـتی؛ ڕاسـت و دروسـت ‹او بـەحـق سـخن مـیگفـت: بـەدروسـتی قـسەی دەکرد›: **بحق**

**بهـداری** / behdārî، ـهـا/: *اسم.* تـەندروسـتی؛ لـەشسـاغی؛ دامـەزراوەیێـک کـە بـەرپرسـی چاوەدێری لە سـاغی و تـەندروسـتی خـەڵـکە. هەروەها: **ادارەی بهداری؛ وزارت بهداری**

**بهداشـت** / behdāšt/: *اسـم.* لـەشسـاغی؛ پـاکژی؛ شـێوە و کارگـەلی پێویـست بـۆ پاراستنی تەندروستی.

▣ **بهداشـت روانـی:** پـاکژی دەروونی؛ تەندروستی دەروونی.

**بهداشت کار:** پاکژیکار؛ تەندروستی کار.

**بهداشت محیط:** پاکژی ژینگـە؛ بـەرگـری لـە پـیس بـوونی ئاقـار و لـە نـاو بـردنی هـۆی نـەخۆشـی. هـەروەهـا: **بهداشـت اجتمـاعی؛ بهداشت غذایی**

**بهداشـتکار** / behdāštkār، ـهـا؛ ـان/: *اسم.* پاکژیکار.

**بهداشـتی** / behdāštî/: *صـفت.* پاکژیکـاری: ١. پێـوەندیـدار بـە تـەندروسـتیەوە ‹فعالیتهای بهداشتی: تێکۆشـانی پاکژیکـاری› ٢. بـەرامبـەر لـەگـەڵ بنـەماکـانی تـەندروسـتیدا ‹مراقبتهای بهداشتی: چاودێری پاکژیکاری›.

**بهداشـتیار** / behdāštyār، ـهـا؛ ـان/: *اسـم.* پاکژییار.

**بهدانـه** / behdāne، ـهـا/: *اسم.* بـەیانـە؛ بـەیدانـە؛ دەنـووە بـەی؛ ناوکـەبـەی؛ تـۆمی بەی؛ دوون بەهـ.

**بـەدردبخـور** / bedardboxor، ـهـا/: *صـفت.* [*گفتـاری*] دەردخـواردوو؛ بـەکارهـاتوو؛ بـەدەرد خـواردی؛ بـەکـەڵـکهـاتوو؛ دەردەوەر؛ لێهـاتوو ‹آدم بەدردبخـوری نیست: کـەسێکی دەردخـواردوو نیە›.

**بـەدردنخـور** / bedardnaxor، ـهـا/: *صـفت.* [*گفتـاری*] دەردنـەخـواردوو؛ بـێبـەهـرە؛ بێکـەڵـک؛ دەرد نـەخـواردی؛ بـەکارنـەهـاتوو؛ دەردنەوەر؛ مەراش.

**بهـدین** / behdîn، ـان/:اسم. بیهـدین؛ بـادین؛ ناوێ کە زەردەشتیەکان بە خۆیانەوە ناوە.

**بهـر** / bahr/:اسم. بـەهـر؛ پـار؛ پـشک؛ بـێش؛ دایەخ؛ سەری: **خارج‌قسمت**

**بهـر** / bahre/: حـرف. [ادبـی] بـۆ؛ ژ بـۆ؛ ئـەڕای؛ پەی ‹بهر من: بۆ من›.

**بهرام** / bahrām/:اسم. ☜ سیاره مریخ، **مریخ**

**بهرامن** / bahrāman/ ☜ **بَهرَمان**

**بهرمـــان** / bahramān/:اسـم. دوڕ؛ یـــاقووتی سوور: **بهرامن؛ بهرمانی**

**بهرمانی** / bahramānî/ ☜ **بَهرَمان**

**بهـروز** / behrûz/: صـفت. [ادبـی] بـەختـــەوەر؛ بـەختیـار؛ بـەهـات؛ خـودان‌بـەخـت؛ پـیرۆز؛ کەسێ کە ڕۆژگارێکی خۆشی هەیە.

**بهـــــروزی** / behrûzî/:اسـم. [ادبـــی] بەختەوەری؛ بەختیاری؛ بەهاتی.

**بهـرە** / bahre، ـهـا/:اسـم. ١. سـوو؛ سـوود؛ بـەهـرە؛ بێـر؛ بـارە؛ بـاهر؛ دایـەخ ‹بهرەی پول: سووی پارە› ٢. بـەش؛ پـاژ؛ هـۆخ؛ بـەر؛ بـاهر؛ گیهـەڤ؛ گـوێچ؛ سـەری؛ پـشکێک لـە شـتێ ‹بهرەداشـتن: بـەش‌دار بـوون› ٣. دەسـهات؛ داهـات؛ بـار؛ بـەرهـەم؛ دایـەخ ‹بهرە دادن: بەرهەم‌دان›.

▣ **بهرەی بانکی**: سووی بانکی.

**بهرەی پول**: سووی پارە.

**بهـرەی مالکانــە**: داهاتانــە؛ زەوی مــڵکانە؛ داهاتی خاوەن زەوی لە ڕەعیەتگەلی.

**بهرەی هوشی**: [روان‌شناسی] بـەشـی هۆشـی؛ ئەندازەی هۆشی هەر کەسێک.

▣ بهرە بردن: ١. قـازانج بـردن؛ کـەڵـک بـردن ٢. بـەهـرە بـردن؛ لـە دەسـهات و ئاکـامی کارێک سوود بردن. هەروەها: **بهرەداشتن**

**بهرە جستن/ گرفتن**: قـازانج‌گـرتن؛ کـەڵـک وەرگرتن.

**بهـرە دادن**: بـەرهـەم دان؛ بـەر دان؛ بـەهـرە دان؛ دەسـهات دان ‹سـرانجام کارگـاە بهـرەی خوبی داد: لە ئاکامدا کارگاکـە بـەرهـەمـی چـاکی دا›.

**بهـرەبـرداری** / bahrebardārî، ـهـا/:اسم. ١. بەرهەم‌هەڵگری؛ کـار یـان ڕەوتی بـەرهـەم بـە دەس هێنـان ‹بهـرەبـرداری از کارخانـەی قنـد: بـەرهـەم‌هـەڵـگری لـە کارخانـەی قـەن› ٢. کـەڵـک‌وەرگـری؛ کـار یـان ڕەوتی کـەڵـک وەرگـرتن ‹آزاد از حرفهـای مـن بـە سود خـودش بهرەبرداری کـرد: ئـازاد لـە قسەکـانم بـە قـازانجی خۆی کەڵکی وەرگرت›: **بهرەگیری**

**بهرەدهی** / bahredehî/ ☜ **بهرەوَری-١**

**بهــــرە کـــــشی** / bahrekešî، ـهـــا/:اسـم. چـەوسـاندنەوە؛ کـار یـان ڕەوتی قـازانج‌گـرتن لـە دەسـهاتی کـاری کـەسێکی دیکـە ‹او بـە بـدترین شـکل از اعـضای خـانوادەاش بهـرەکـشی می‌کرد: بـە خراپـترین شـێوە بنـەماڵـەکـەی خـۆی دەچەوساندەوە›. هەروەها: **بهرەکش**

**بهرەگیری** / bahregîrî/ ☜ **بهرەبَرداری -٢**

**بهــــرەمنـــــد** / bahremand، ـان/: صـفت. بەهرەمـەنـد؛ بـەهـرەوەر؛ بـەشـدار؛ بـەهـرەدار؛ خاوەن فایدە ‹او از ذهن خـوبی بهـرەمنـد اسـت: لـە زەینێکی باش بەهرەمەندە›.

**بهـــرەمنـــدی** / bahremandî، ـهـا/:اسـم. بەهرەمـەنـدی؛ بـەشـداری؛ بـەهـرەداری؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەهرەدار بوون.

**بهـــرەوری** / bahrevarî، ـهـــا/:اسـم. ١. بـەهـرەدەری؛ چۆنیـەتی بـەرهـەم یـا سـوود دان: **بهـــرەگیـــری** ٢. کـەڵـک وەرگـری؛ بەهرەگری چاک، ژیرانە و ئابووریانە.

**بهزراعـــی** / behzerā'î/: [فارسـی/ عربـی]اسـم. زانـست یـان زانـستیاری چـاک‌کـردنی شێوەگەلی کشت و کاڵ.

**بهزیـــستی** / behzîstî/:اسـم. ١. ئاسایـــشت؛ چـاک‌ژیـان؛ خـاس‌زنـەی؛ کـار و

بەراوردگەلێک بۆ باش و بە ئاسوودەیی ژیان ٢. مەزرینگەیەک بۆ باشترکردنی ژیانی کۆمەڵ.

**بهسازی** / behsāzî، ـها/:اسم. چاکەسازی؛ کار و پێشبینیگەلێک بۆ باشترکردنی باری کار و ڕەوتی ژیان.

▣ **بهسازی محیط:** چاکەسازی ژینگە؛ باشتر کردنی جێ ژیان، بە دانان و بەدیهێنانی پێویستیەکانی ژێگە و لەناو بردنی هۆی نەخۆشی و دەرد و ئازار.

**بهش** / beheš، ـان/: ضمیر. [گفتاری] ١. پێی؛ بەو؛ بەئەو؛ پێ؛ پی؛ پنەش؛ پەنەش؛ پەیش؛ ئەپێ؛ بۆی ‹بهش نمی‌آمد دُزد باشد: پیی نەدەخوارد دز بێ› ٢. لێ؛ لێی؛ بەوە؛ بەئەوە؛ وەنەش؛ ونەش؛ پوەش ‹بهش دست نزن: دەستی لی مەدە›.

**بهشان** / behešān/: ضمیر. [گفتاری] ١. پێیان؛ بۆیان؛ بەوان؛ پنەشا؛ پەنەشا؛ پەیشا ‹بهشان گفتم؛ بهشان زنگ زدم: وتم پییان؛ زەنگم دا بۆیان› ٢. لێیان؛ لیان؛ پوەشا؛ ونەشا؛ وەنەشا؛ بۆ شت ‹بهشان رنگ قرمز زدم: ڕەنگی سوورم دا لییان›.

**بهشت** / behešt/:اسم. بەهەشت؛ بوهیشت؛ بەهشت؛ بەهێشت: ١. شوێنی زۆر خۆش بۆ چاکان، دوای مردن ٢. [مجازی] جێگای زۆر خۆش و بەدیمەن لە سەر ئەم دنیایەدا.

**بهشت آسا** / behešt'āsā/: صفت. [ادبی] بەهەشتئاسا؛ وەکوو بەهەشت.

**بهشت آیین** / behešt'āyîn/ ☜ **بهشت آسا**

**بهشتی** / beheštî/: صفت. بەهەشتی: ١. پەیوەندیدار بە بەهەشتەوە ‹نسیم بهشتی: شنەی بەهەشتی› ٢. ـها؛ ـان/ ئەوەی وا ئەهلی بەهەشت بێ ‹حوری بهشتی: حۆری بەهەشتی› ٣. ـها؛ ـان/ شایانی چوونە بەهەشت ٤. [مجازی] جوان و دڵڕفێن ‹بهشتی صورت: سیما بەهەشتی›.

**بهکده** / behkade، ـها/:اسم. شوێنێکی دوور لە شاری دابینکراو بۆ ڕاگرتنی لاوانی ئازوبەزکار.

**به کرات** / bekarrāt/: [فارسی/ عربی] قید. چەلان؛ چەندجاران؛ چەندکەڕەت؛ زۆر جاران؛ فرەوجارا؛ چن جاریو ‹به کرات او را دیده بودم: زۆر جاران ئەوم دیبوو›.

**بهل** / behel/ ☜ **أرْس**

**بهم** / beham/ ☜ **بەهَم**

**بهم** / behem، ـان/: ضمیر. [گفتاری] پێم؛ بەمن؛ وەپیم؛ پنەم؛ پەنەم ‹بهم گفته بود: گوتبووی پیم›.

**بهمان** / bahmān/: ضمیر. فیسار؛ فیسارە کەس؛ جێناوی نەناسراو، کە زۆرتر لەگەڵ فلاندا دێت ‹هر روز می‌گفت برو فلان را ببین و بهمان را دعوت کن: هەموو ڕۆژێ دەیگوت بچۆ فلانەکەس ببینەوە فیسارەکەس بانگ بکە›.

**بهمان** / behemān/: ضمیر. [گفتاری] بەئێمە؛ پێمان؛ وەئێمە؛ وەپێمان؛ پنەما؛ پەنەما ‹بهمان پول داد: پوولی دا پیمان›.

**بهمن** / bahman، ـها/:اسم. ١. هەرەس؛ هەرەسە؛ ڕنی؛ ڕنوو؛ ڕەنۆ؛ شاپە؛ کەوی؛ کۆمایەکی گەورە لە بەفر کە لە بەرزاییەوە بەر دەبێتەوە ٢. ڕێبەندان؛ مانگی ڕێبەندان؛ مانگی یازدەهەمی ساڵی هەتاوی ئێرانی کە ٣٠ ڕۆژە ٣. ☜ **بهمنی**

**به منزله ی** / bemanzeleye, -zaleye/: [فارسی/ عربی] حرف. وەکوو؛ وەک؛ پیسەو؛ دەڵێی ‹او به منزلەی پسر من است: ئەو وەکوو کوڕی منە›.

**بهمنگیر**[1] / bahmangîr، ـها/:اسم. هەرەسگر؛ هەرەسگیر؛ میچێکی لێژ بۆ پارێز لە هەرەس کە لە سەر جادەوە ساز دەکرێ.

**بهمنگیر** [٢]: *صفت.* هەرەسگا؛ هەرەسگە؛ هەرەسگر؛ هەرەسیا؛ شوێنی وا هەرەسی لێ بکەوێ.

**بهمنی** / bahmanî، ـها/: *اسم.* مارەچووکێ؛ فریسک؛ ڕوەکێک کە زۆرتر لە قەراخی ئاوەوە شین دەبێ: **بهمن**

▣ **بهمنی سرخ:** فریسکی سوور؛ جۆرێک مارەچووکێی گوڵ سوور.

**بەناحق** / benāhaq/: [فارسی/ عربی] *قید.* بەناڕەوا؛ ناحەق؛ بە پێچەوانەی ڕاستی ‹بەناحق مالش را غارت کردند: بەناڕەوا مالیان بە تالان برد›.

**بەناخواست** / benāxāst/: *قید. [ادبی]* بە نەوەدڵی؛ نەبەدڵانە؛ بە نەویستی ‹بەناخواست خانەاش را فروخت: بە نەوەدڵی ماڵەکەی فرۆشت›.

**بهنجار** / behancār/: *صفت. [ادبی]* گونجاو؛ جێ‌کەوتوو؛ ڕێک‌وپێک؛ لەبار؛ لەباو ‹رفتار بهنجار: ئاکاری گونجاو›.

**بهنژادی** / behnejādî/: *اسم.* زانستی چاک کردنی بنەچەی گیا، گیانەوەر یان مرۆڤ.

**بهنگام** / behengām, behangām/: *قید. [ادبی]* سەرگاف؛ لە سەرکات؛ سەروەخت؛ بەوەخت؛ ڕاست لە کاتی شیاودا.

**بهورز** / behvarz، ـها؛ ـان/: *اسم.* کەسێ بە خوێندنی قۆناغی ناوەندییەوە کە پاش خوێندن لە فێرگەی تەندروستی، لە لادێ کار دەکا.

**بهوش** / behûš/: *صفت.* وریا؛ هووشیار؛ وشیار؛ شیار؛ گوێ‌قولاغ؛ پاسەوان ‹بهوش باشید: وریا بن›.

**بەهم** / beham/: *قید.* ١. بەیەکەوە؛ پێکەوە؛ وەگەردیەک؛ یۆوە؛ یۆرە؛ پێوەرە؛ دگەلێک؛ بهەڤرە ٢. تێکەڵ؛ پێکەڵ؛ ئاوێتە؛ بەیەکا؛ لەیەکا؛ یۆنە؛ وریۆنە؛ لە ناو یەکدا ✻ **بهم**

▣ **بەهم برآمدن:** *[کنایی]* دانە/چوونە یەکا؛ دەی پێوەرە؛ خەمین و زیز بوون.

**بەهم برخوردن:** ١. تووشی یەکتری هاتن؛ گەیشتنە یەک؛ گەیینەیەک؛ یاوەی هەنترینی ٢. پێک دادان؛ لێک کەوتن؛ لێک دان؛ دان لە یەک؛ دانەقەو یەکا؛ ماڵەی یۆیرە.

**بەهم پیوستن:** بوونە یەک؛ بوونە یەکێ؛ یەک گرتن؛ هەڤ گرتن؛ هاودەنگ بوون؛ یۆگێرتەی.

**بەهم خوردن:** ١. تێکچوون؛ شڵەژان؛ هەڵشێویان؛ تێکشیەی؛ شێویەی ٢. لێک کەوتن؛ لێک‌دان؛ هەڵتەقین؛ لێک ماڵین؛ بە یەکتری گەیشتن؛ ماڵەی یۆیرە ٣. تێکچوون؛ شێویان؛ تێکشیەی؛ لە بەین چوون ‹دوستیشان بەهم خورد: دۆستایەتیان تێکچوو›.

**بەهم رسیدن:** گەیشتنە یەک؛ پێک‌گەیشتن؛ وە هەم ڕەسین؛ یاوەی یۆی؛ یاوەی هەنترینی.

**بەهم ریختن:** ١. تێکچوون؛ شڵەژان؛ شێویان؛ تێکشیەی؛ شێویەی ٢. شێواندن؛ شڵەژاندن؛ تێکدان؛ ئاڵۆز کردن؛ شێونەی؛ تێکدەی ٣. دارمان؛ ڕووخان؛ ڕمیان؛ ڕمان؛ وریەی.

**بەهم زدن:** ١. تێکەڵ کردن؛ دانە یەکا؛ دەی وریێو؛ دەی چنە ٢. ولیقانن؛ شێواندن؛ شێونەی ٣. لە یەک‌دان؛ لێک‌دان؛ ماڵەی هەنترینیەرە؛ ماڵەی یۆیرە؛ دان لە یەکی دو یان چەند شت ٤. شێواندن؛ هەڵشێواندن؛ بەتاڵ کردنەوە؛ شێونەی. هەروەها: **بەهم آمیختن؛ بەهم کوبیدن**

**بهیار** / behyār، ـها؛ ـان/: *اسم.* بەردەستی پەرەستار لە نەخۆشخانەدا.

**بهیمـــی** / bahîmî/: [عربـــی] صـــفت. [ادبـــی] درندانــه؛ حــه‌یــوانی؛ دوور لــه خۆوخــده‌ی مرۆڤانه؛ پێچه‌وانه‌ی ئینسانی.

**بهینــه** / behîne/: اســم. باشــترین؛ چــاکترین؛ چــاترین؛ خاســـترین؛ بـــه‌یتـــرین؛ باشـــێنه؛ باشینه؛ باشه‌وه؛ له باشترین بارودۆخدا.

**بهینـــه‌ســـازی** / behînesāzî/: اســم. کــار یــان ڕه‌وتی به‌دیهێنـانی باشـترین بـاری شـیاو یـان ڕه‌چاوکراو.

**بـــی**[1] / bî/: حـرف. ۱. بـــێ؛ بـه بـێ؛ نـه‌بـوونی شتێک ‹بی اجازه‌ی شما شروع نمی‌کنیم: بـه بـی ئیجـازه‌ی ئێـوه ده‌س پـێ ناکـه‌یـن› ۲. نـاوی دووهه‌م پیتی ئه‌لفوبێتکه‌ی لاتین (B,b).

**بی -**[2]: پیشوند. بێ- ؛ نیشانه‌ی نه‌رێـنی ‹بی‌پول: بی‌پاره›.

**بـــی‌آبـــرو** / bîyābrû, bî-'āberû/: ـهـا؛ ـیـان/: صـــفت. ۱. نـــز؛ نـــزم؛ هـــه‌تـــک؛ ســـووک و چرووک؛ گـدی؛ بـێ‌ئابـڕوو؛ تـڕه‌ک؛ ئابڕوونـه‌دار ۲. ئابـــــڕووتکاو؛ ئابـــــڕوورژاو؛ ســـــاواز؛ ڕووهـــه‌ڵماڵـــراو؛ بــێ‌ڕۆ؛ گۆســـارتمه؛ ســـووک لـــه‌بـــه‌ر چـــاوان؛ دۆقدۆقـــه؛ چـــه‌تـــاوه‌ڕوو؛ چـــه‌تـــاوه‌ســـۆ؛ ڕووســـیا ۳. بـــه‌دنـــاو؛ نـــاوزڕاو؛ قیچمه‌ز؛ پله‌نده‌ر؛ هه‌تکی.

**بـــی‌آبروئـــی** / bîyābrû'î, bî-'āberû'î/ ☜ **بی‌آبرویی**

**بـــی‌آبرویـــی** / bîyābrûyî, bî-āberû' î/: ـهـا/: اســم. نزمـــی؛ بـــێ‌ئاکـــاری؛ بـــێ‌ئابـــڕوویی (بـــه هه‌رسێک ماناکانی بی‌آبرو) * **بی‌آبروئی**

**بـــی‌آبـــی** / bî-'ābî/: اســم. بـێ‌ئـاوی؛ وشـکـی؛ وشـــارۆیی ‹درختهـا از بـی‌آبـی خـشکیدند: داره‌کـان له بەر بێ‌ئاوی، وشک بوون›.

**بیابـان** / biyābān/: ـهـا/: اســم. بیـاوان؛ یـاوان؛ یابـان؛ یـابۆن؛ بیابـان؛ بێیـاوان؛ گـه‌وه‌ر؛ چـۆڵ؛ چـۆڵ؛ چۆڵـگه؛ چـۆڵایی؛ وشـکارۆ؛ حـشکاره؛ هه‌رده؛ بێـروون؛ ئـاواق؛ لـه‌یـلان؛ شـافر؛ سـارا: ۱. پانایـیـه‌کـی بـه‌ربـڵاوی بـێ ڕووه‌ک یـان بـه درک و داڵ و پـووش و پـه‌ڵاش، بـه بـارانی کـه‌م و ژیـواری سـنووردارەوه ‹بیابـان مرکـزی ایران: بیاوانی ناوه‌نـدی ئێـران› ۲. هـه‌ر چـه‌شـنه پانایـیـه‌کـی بـه‌ربـڵاوی ئـاوه‌دان نـه‌کـراو ‹سر گذاشـت بـه کـوه و بیابـان: کـه‌ژ و بیاوانـی گرتـه به‌ر›.

**بیابـــانگرد** / biyābāngard/: ـهـا؛ ـان/: صـفت. بیاوانگـه‌ڕ؛ هـه‌رده‌گـێڵ؛ بـه‌گـه‌وشـینی گـه‌ڕان یـان کـۆچ لـه بیاوانـدا ‹قبیلـه‌ی بیابانگرد: هـۆزی بیاوانگه‌ر›.

**بیابـــانگردی** / biyābāngardî/: ـهـا/: اسـم. بیاوانگـه‌ڕی؛ گـه‌وه‌رگـه‌ڕی؛ هـه‌رده‌گێـڵی: ۱. دۆخ یـان چۆنیـه‌تی بیاوانگـه‌ڕ بـوون ‹زنـدگی بیابـانگردی: ژیـانی بیاوانگـه‌ری› ۲. چۆڵـگه‌ڕی؛ ژیان و تێکۆشان لـه بیاوانـدا ‹مدتی کـار‌ش شده بـود بیابـانگردی: مـاوه‌یـه‌ک کـاری ببـووه بیاوانگه‌ری›.

**بیابـــان‌نـــشین** / biyābān.nešîn/: ـهـا؛ ـان/: صفت. ده‌شـته‌کـی؛ گـه‌وه‌رنـشین؛ چـۆڵ‌نـشین؛ هـه‌رده‌نـشین؛ بیـاوان‌نـشین؛ چـۆڵاییـ‌نـشین؛ سارانشین.

**بیابـــانی** / biyābānî/: صـفت. ۱. وشـــکارۆیی؛ ده‌شتی؛ گـه‌وه‌ری؛ هـی بیـاوان ‹گیاهـان بیابـانی: گـــژ و گیـــای وشـــکارویی› ۲. [مجـــازی] چۆڵـپه‌رست؛ هێـڤی؛ وه‌حـشی ‹غـول بیابـانی: ده‌عبـای چولـپه‌رسـت› ۳. بیـاوانی؛ گـه‌وه‌ری؛ ده‌شـتی؛ سـه‌ر بـه بیـاوان ‹جـاده‌ی بیابـانی: ڕێگای بیاوانی›

**بیـــابرو** / biyāboro/: ـهـا/: اسـم. [گفتـاری] ۱. هـــاتوچـــوو؛ ئامـــه‌وشـــۆ؛ ئامـــشۆ؛ ئامـــشه‌و؛ ئامشۆڕه‌فـت؛ ئامـه‌ولوه‌ی ‹دیـشب تـوی کوچـه‌ی مـا بیـابرو زیـاد بـود، معلـوم شـد دزد خانـه‌ای را زده: دوێنـێ‌شـه‌و لـه کـۆڵانی ئێمـه‌دا هـاتوچـوو زۆر بـوو، ده‌رکـه‌وت دز ماڵـێکی بـڕیوه› ۲. ئـاوه‌نـد و

ڕەوەند؛ ئاوەن و ڕەوەن؛ بـرەم‌ـبـرەم ‹این خانه یـک وقـت بیـابرویی داشـت: ئـەم مالـە ڕۆژگارێـک ئاوەند و ڕەوەندیکی بوو›.

**بیات** [1] / bayāt/: [ترکی/ ؟]/اسم. بـەیـات؛ چـەن پـاژ لـە ئـاوازی موسـیقای ئێـرانی ‹بیـات زنـد: بەیاتی زەند›.

**بیات اصفهان** ☜ **اصفهان**

**بیـات تـرک**: ئاوازێـک لـە دەزگـای شـووری مۆسیقای ئێرانی: **بیات زند**

**بیات زند** ☜ **بیات ترک**

**بیات** [2] /ـها/: [عربی] صفت. پـەزێـرە؛ شـەومـەن؛ شەومەنە؛ شـەوی؛ بـەیـات؛ نـان‌بـەیـات؛ نـانی کۆن کە شەوی بە سەردا هاتبێتەوە.

**بـی‌آلایـش** / bî-'ālāyeš/: صفت. ۱. خـاوێن؛ پـاک؛ پـاکژ؛ بـژون؛ دوور لـە پیـسی ‹زنـدگی بـی‌آلایـش: ژیـانی پـاک› ۲. بـێ‌گـرێ؛ بـێ‌تـەشـقەڵـە؛ بـێ‌مـەرایـی؛ سـاوا؛ بـێ‌ڕیـا؛ بـەبـێ‌گـرێ و گـۆڵ ‹دوسـتی بـی‌آلایـش: دۆستایەتی بی‌گری›.

**بـی‌اتیکـت** / bî'etîket، ـها/: [فارسی/ انگلیسی] صفت. بـێ‌ئاکـار؛ بـێ‌ئـەخـلاق؛ بـێ‌ئـەدەب؛ بێ‌مشوور.

**بـی‌اختیـار** [1] / bî'extiyār/: [فارسی/ عربی] صفت. بـێ‌دەسـەلات؛ بـێ‌ئـازادی؛ بـێ‌سـەربـەسـتی یـان مـافی ئـەنجامـدانی کارێک ‹نوکر بی‌اختیار: نۆکەری بی‌دەسەلات›.

**بـی‌اختیـار** [2]: قید. بـێ‌هاگـا؛ بـە بـێ ویـست و بـڕیاری پێـشوو ‹تـا او را دیـدم بـی‌اختیـار زدم زیـر گریه: تا دیتم بی‌هاگا دام لە قولپەی گریان›.

**بـی‌اختیـاری** / bî'extiyārî/: [فارسی/ عربی] /اسم. ۱. بـار و دۆخ یـان چۆنیـەتی نـەبـوونی دەسـەلات ۲. دۆخ یـان چۆنیـەتی نـەبـوونی دەست‌ودوو یـان ویـست بـۆ ئـەنجـامدانی کـار یان ئاکاری ڕەچاوکراو.

**بـی‌ادب** / bî'adab، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. نخـای؛ بـێ‌ئـەدەب؛ ڕەوشـت‌خـراپ؛ بێ‌ئاکار؛ بێ هـەڵـس‌وکـەوتی لـەبـاو و گونجـاو لە کۆمەڵگادا.

**بـی‌ادبانـه** [1] / bî'adabāne/: [فارسی/ عربی/ فارسی] صفت. نخایانـە؛ هـاوڕێ لـەگـەڵ ئاکـاری ناشیرینـدا ‹رفتار بی‌ادبانه: ئاکاری نخایانە›.

**بی‌ادبانـه** [2]: قید. نخایانـە؛ دوور لـە نـەریـت ‹بـا آنها بی‌ادبانـه سـخن مـی‌گفـت: لـەگـەڵـیاندا نخایانـە دەدوا›.

**بی‌ادبـی** / bî'adabî، ـها/: [فارسی/ عربی] /اسم. نخایی؛ هـەڵـس‌وکـەوتی نالـەبـار و نـەگونجـاو بە پێچەوانەی ڕستی کۆمەڵگا.

**بـی‌اصـل** / bî'asl/: [فارسی/ عربی] صفت. ۱. [نامتـداول] درۆ؛ بـێ‌پایـە ۲. ☜ **بـی‌اصـل و نسب**

**بـی‌اصـل‌ونـسب** / bî'asl-o-nasab، ـهـا/: [فارسی/ عربی] صفت. بـێ‌بناغـە؛ بـێ‌ڕەتـەوە؛ بێ‌بنەچە؛ بـێ‌پێـز؛ نـاڕەسـەن؛ بـێ‌کـەس‌وکـار؛ بـێ‌ڕەگـەز؛ گـونج‌خـواردە؛ بـێ‌بنـەماڵـە و ڕەتەوەی ناسراو: **بی‌اصل ـ۲**

**بیـاض** / bayāz/: [عربـی]/اسـم. ۱. [ادبـی] سپیەتی؛ چەرمگـی؛ چـەرمـوویی؛ چـەرمـەیـی ۲. [قـدیمی] یـاز؛ دەفتـەری لای‌دەس؛ دەفتـەری بـەخـەڵـی ۳. [قـدیمی] دەفتـەرێکی درێـژ و بـاریکی بـەرگ گـیراو بـۆ نووسـینی هەڵـبژاردەی شـیعری شـاعیران و قـسەی نەستەق و پەندی پێشینان.

**بیاضی** / bayāzî/: [عربی] ☜ قطع بیاضی، **قطع**

**بـی‌اطـلاع** / bî'ettelā'/: [فارسی/ عربی] صفت. بـێ‌هاگـا؛ نائاگـا؛ بـێ‌خـەوەر؛ بـێ‌خـەبـەر؛ بـێ‌جـەی: ۱. دۆخ یـان چۆنـاوچۆنی هاگـا نەبوون ‹مـن از مریـضیتان بـی‌اطـلاع بـودم: مـن لـە نـەخۆشـیتان بـێ‌ئاگـا بـووم› ۲. بـە بـێ‌ئاگـایی ‹ایـن روزنامـەنویـسهای بـی‌اطـلاع...: ئـەم ڕۆژنامەنووسە بێ‌ئاگایانە...›.

**بی‌اعتبار** / bî'e'tebār/: [فارسی/ عربی] صفت. ۱. بێ‌بڕ؛ بێ‌بڕەو؛ بێسە؛ کەمتەرخ؛ بەبێ نرخ و سەنگ ‹این چکها بی‌اعتبار است: ئەم چەکانە بێ‌بڕن› ۲. نەلێیە؛ بێ‌ئۆرت؛ نەجێ‌باوەڕ ‹این سقف بی‌اعتبار است: ئەم میچە نەلێیەیە›. هەروەها: **بی‌اعتباری**

**بی‌اعتنائی** / bî'e'tenā'î/: [فارسی/ عربی] ☜ **بی‌اعتنایی**

**بی‌اعتنایی** / bî'e'tenāyî، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. پشت‌گوێخەری؛گوێ‌پێ‌نەدەری؛ پشت‌تێکری؛ کار یان ڕەوتی ئاوڕ نەدانەوە یان گرنگی پێ‌نەدان: **بی‌اعتنائی**. هەروەها: **بی‌اعتنا**

**بی‌امان** / bî'amān/: [فارسی/ عربی] صفت. بێ‌حەسانەوە؛ بێ‌ئەمان ‹جنگ بی‌امان: شەڕی بێ‌حەسانەوە›.

**بیان** / bayān/: [عربی]/اسم. ۱. وتە؛ گوتە؛ واتە ‹بیان من قاصر است: وتەی من ناتەواوە› ۲. کار و ڕەوتی وتن؛ گوتن، واتەی؛ دەربڕین ‹بیان مقصود: وتنی مەبەست›. هەروەها: **بیان داشتن؛ بیان شدن؛ بیان کردن**

**بیانات** / bayānāt/: [عربی]/اسم. [ادبی] وتە و واتە؛ قسەگەل؛ ئەوەی لە دانیشتنێکی فەرمی (ڕەسمی)دا دەگوترێت.

**بی اندازه** / bî-'andāze/: صفت. لەڕادەبەدەر؛ بێ‌ئەنازە؛ بێ‌ئەناز؛ بێ‌وزە؛ بێ‌شوۆ؛ بێ‌گۆڕە؛ بێ‌هەند؛ بێ‌هەژمار؛ وەتام؛ بێ‌سەر؛ هێجگار زۆر ‹ثروت بی‌اندازه: سامانی لە ڕادە بەدەر›.

**بی‌اندام** / bî-'andām/: صفت. [نامتداول] ناڕێک؛ نابار؛ نالەبار.

**بیانگر** / bayāngar/: [عربی/ فارسی]/اسم. نیشاندەر؛ ڕوونکەرەوە؛ کار یان ڕەوتی ئاشکرا کردن و هەواڵدانی دیاردە یان ڕووداوێک.

**بیانی** / bayānî/: [عربی] صفت. واتەبێژی؛ گوتنی؛ وتنی: ۱. پێوەندیدار بە وتنەوە ‹شیوەهای بیانی: شێوازگەلی وتەسەری› ۲. پێوەندیدار بە قسەکردنەوە ‹اختلالهای بیانی: شێواوی لەگوتندا›.

**بیانیه** / bayānîyye، ـها/: [عربی]/اسم. داخویان؛ نووسراوی پێودان و ڕێ و شوێن بۆ خەڵک.

**بی‌باک** / bîbāk/: صفت. [ادبی] چاونەترس؛ ئازا؛ نەترس؛ بوێر؛ دلێر؛ بێ‌باک؛ بەجەرگ؛ گەڕناس؛ زیخ؛ جامێر؛ چاونەترساو؛ موکور؛ چەلاق؛ بێ‌تەرس؛ کەلەوا؛ کەلەبا؛ گرۆبەندە ‹مرد بی‌باک: پیاوی ئازا›.

**بی‌باکی** / bîbākî، ـها/:/اسم. نەترسی؛ ئازایی؛ بێ‌باکی؛ بوێری؛ دلێری.

**بی‌بته** / bîbotte/: صفت. [گفتاری، کنایی] بێ‌ڕەگ؛ بێ‌دەمار؛ بێ‌هۆڕ؛ لێ‌نەهاتوو؛ بێ‌غیرەت ‹آدمِ این‌قدر بی‌بته ندیده بودم: مرۆی هێندە بێ‌ڕەگم نەدیبوو›.

**بی‌بخار** / bîboxār/: [فارسی/ عربی] صفت. [کنایی] کوسەک؛ لێ‌نەهاتوو؛ بێ‌ڕەگ؛ درمن؛ بێ‌دەس و پێ؛ دەست و پێ سپی.

**بی‌بروبرگرد** / bîborobargard/: قید. [گفتاری] بێ‌سێ و دوو؛ بێ‌شک؛ بەدڵنیایی.

**بی‌بضاعت** / bîbezā'at, bîbazā'at/: [فارسی/ عربی] صفت. بێ‌شت؛ بێ مال و دارایی؛ هەژار؛ نەدار؛ دەسکورت؛ مانقێر؛ دەستەنگ؛ فەقیر.

**بی‌بند و بار** / bîband-o-bār/: صفت. گەوەند؛ گەڤەندە؛ قەفان؛ حولحولی؛ بێ‌بار؛ پرتۆک؛ بێفرشک؛ سەربەردای؛ گەلڵا؛ لاقەید؛ بێ‌ڕێ‌وشوێن؛ بەرەڵلا.

**بی‌بو و خاصیت** / bîbû-vo-xāsîy(y)at/: [فارسی/ عربی] صفت. [کنایی] تەوش؛ بێخۆ؛ پووچەڵ؛ بێ‌کەڵک؛ دەردنەخۆر؛ بێ‌وەر؛ بێ‌کارکۆ؛ دەست و پێ سپی.

**بی‌بی** / bîbî، ـھا/: [ترکی]/اسم. ۱. *[قدیمی]* کەیوانوو؛ کەیوانۆ؛ کەوانۆ؛ کابان؛ خاتوون؛ خادێ؛ خادە؛ خاد؛ خاتە؛ خاتێ؛ ستی؛ ئەستی ۲. دایەگەورە؛ ماما؛ داپیر ۳. پوور؛ پلک؛ دیوە؛ تیتک؛ میمک؛ میمی؛ مەت؛ مەتی؛ دییە؛ خوشکی باوک ٤. لە خاڵگەلی وەرەق کە لە نێوان شا و سەربازدایە.

**بی‌پا** / bîpā، ـھا؛ ـیان/: صفت. *[گفتاری]* ۱. بێ‌پا؛ کەسێ یان شتێک کە پای پێویستە بەلام نیەتی ۲. بێ‌جوولە؛ بێ‌پل‌وپۆ؛ بێ‌دەست و دوو؛ کەسێ کە هات‌وچووی پێ نەکرێ یان نەتوانێ بجوولێتەوە ۳. بێ‌پایە؛ بێ بنج و بناوان؛ بێ‌سەرە و بەرە؛ پووچ؛ بێ‌ناوەرۆک ‹حرفهایش بەکلی بی‌پاست: وتەکانی بەتەواوی بێ‌پایەن›.

▣ **بی پا کردن**: لە دەست و پا خستن؛ لە جوولە خستن؛ هەژار و بێ‌ئەنواکردن؛ بێ‌دەس کردن؛ بێ‌دەسەلات کردن.

هەروەها: **بی‌پا شدن**

**بی‌پایان**: صفت. بێ‌برانەوە: ۱. بێ‌بن؛ لەبن‌نەهاتوو ‹اندوه بی‌پایان: کەسەری بێ‌برانەوە› ۲. یەکجار زۆر ‹ثروت بی‌پایان: سامانی بێ‌برانەوە› ۳. دوور و درێژ؛ بێ‌گامە؛ زۆر دوور ‹راه بی‌پایان: ڕێگەی بێ‌برانەوە›.

**بی‌پایە** / bîpāye/: صفت. بێ‌بنەڕەت؛ بێ‌پایە؛ بێ‌پنج و ڕەگ.

**بی‌پدرمادر** / bîpedarmādar/ ☜ **بی‌پدرومادر**

**بی‌پدر و مادر** / bîpedar-o-mādar/: صفت. بێ‌دایک و باوک: ۱. *[کنایی]* بێ‌باق؛ بێ‌ئاکار؛ گریجان؛ بە خدە و خووی نالەبارەوە ۲. زۆڵ؛ بیج؛ بیچ؛ بێژوو؛ سنۆتە؛ حەرامزا ❋ **بی‌پدر مادر**

**بی‌پرده**[1] / bîparde/: صفت. *[کنایی]* بەڕاشکاوی؛ هەربێ؛ ئاشکرا؛ ڕەپ و ڕاست؛ پان بە پان؛ سەراقکی؛ بێ‌ڕوودەروایسی؛ بێ‌پێچ و پەنا؛ ڕاست و ڕەوان؛ ڕووت‌وڕاس؛ ڕت‌وڕاست؛ بێ ڕووبینی؛ بەبێ‌گرێ و گۆڵ ‹انتقادهایش بی‌پرده بود: ڕەخنەکانی بەڕاشکاوی بوون›.

**بی‌پرده**[2]: قید. بەڕاشکاوی؛ بە ئاشکرایی؛ ڕەپ و ڕاست؛ بێ‌پێچ و پەنا ‹خیلی بی‌پرده می‌نوشت: زۆر بەڕاشکاوی دەینووسی›.

**بی پروا**[1] / bîparvā/: صفت. نەترس؛ موکور؛ ئازا؛ بێ‌پەروا؛ کێمخوا؛ بستە ‹پسری بی‌پروا بود: کوڕێکی نەترس بوو›.

**بی پروا**[2]: قید. بەبێ‌ترس؛ بێ‌پەروا؛ ئازایانە ‹بی‌پروا پیش می‌رفت: بەبێ‌ترس دەچووە پێشەوە›.

**بی‌پروائی** / bîparvā'î/ ☜ **بی‌پروایی**

**بی‌پرواز** / bîparvāz، ـھا؛ ـان/: صفت. *[زیست‌شناسی]* نەفڕ؛ باڵنەگر؛ بێ‌فڕ؛ بێ تایبەتمەندی یان توانایی فڕین (وەک مریشک).

**بی‌پروایی** / bîparvāyî، ـھا/: اسم. ۱. بوێری؛ موکوری؛ دۆخ یان چۆنیەتی بێ‌پەروا بوون ‹این‌قدر بی‌پروایی هم خوب نیست: ئەوندەش موکوری باش نیە› ۲. ڕووداری؛ گوساخی؛ وساخی؛ ڕیلاسی؛ ڕاوری ‹بی‌پروایی او ما را هم گرفتار کرد: ڕووداری ئەو ئێمەشی تووش‌کرد› ۳. نەترسی؛ ئازایی؛ بێ‌باکی ‹همه از بی‌پروایی او حساب می‌بُردند: هەموان لە نەترسی ئەو کۆیان دەکردەوە› ❋ **بی‌پروائی**

**بی‌پر و پا** / bîpar-o-pā/: صفت. پووچەڵ؛ پووچ؛ ناوبەتاڵ؛ بێ‌پایە؛ بێ‌ناوەرۆک؛ بێ‌سەرە و بەرە؛ هیچ و پووچ؛ پووچەڵپووچ.

**بی‌پیر** / bîpîr/: صفت. *[گفتاری]* بێ‌پیر؛ بێ‌بڕوا؛ بێ‌ئایین؛ بە بێ‌ئایین یان بنەمای ئەخلاقی شیاو (جنێویکە).

**بی‌پیرایە** / bîpîrāye/: صفت. ۱. ساف و سادە؛ دەس لێ نەدراو ۲. *[مجازی]* بێ‌گەرد؛

بێ گرێ و گۆڵ؛ بێ ڕیا؛ بێ مەرایی.

**بیت** / bayt/: [عربی]/اسم. ١. ـها؛ ابیات/ دێڕ؛ چام؛ بەیت؛ ماڵک؛ یەکەی شیعری عەرووزی، بریەتیە لە دوو باڵ ‹این بیت از مولوی است: ئەم دێڕە هی مەولەویە› ٢. /بُیوت/ [ادبی] ماڵ؛ یانە؛ خانوو ‹بیت خدا: ماڵی خودا› ٣. [کنایی] بنەماڵە؛ خێزان (زیاتر بۆ ژن و منداڵی پیاوی ئایینی دەگوترێ).

**بیت** / bît/، ـها/: [انگلیسی]/اسم. بیت؛ نیتکە؛ بچووکترین پاژی زانیاری کە لە کامپیوتەردا جێ دەبێتەوە.

**بی تاب** / bîtāb/: صفت. بێ وزە: ١. بێ تاو؛ بێ تەشە؛ بێ برە؛ بێ هێز و تابشت؛ شل وول؛ خۆڕانەگر لە بەرانبەر گوشارەوە ٢. بێ هەدا؛ بێ بێن؛ بێ پشوو؛ بێ تاقەت؛ بێ ئارام؛ بێ ئوقرە.

**بی تابی** / bîtābî، ـها/: اسم. گرجی ورجی؛ بێ ئارامی؛ بێ قەراری؛ بێ ئوقرەیی: ١. بێ هازی؛ بێ تەشەیی؛ بێ تاوی؛ لە برە بوونەوە و نەبوونی هێز و توانایی بۆ درێژە پێدانی بار و دۆخێک ‹این قدر بی تابی نکن الان تمام می شود: ئەمەندە بێ ئارامی مەکە ئێستە دوایی دێت› ٢. پاوپایی؛ گوروتاوی؛ بێ ئۆقرەیی بەهۆی چاوەڕوانیەوە ‹مادرش خیلی بی تابی می کرد: دایکی زۆر پاوپایی دەکرد›.

**بیت الله** / baytollāh/: [عربی]/اسم. ماڵی خوا؛ یانەو خوای؛ کەعبە؛ کابە.

**بیت المال** / baytolmāl/: [عربی]/اسم. بەیتولماڵ: ١. خەزانەی دەوڵەتی ئیسلامی ٢. ماڵ و دارایی دەوڵەتی ئیسلامی.

**بی تربیتی** / bîtarbîyatî، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. بێ ئاکاری؛ بێ ئەدەبی؛ بێ یۆڵیێ؛ لە چاو دەرچیەتی؛ بێ بەشی لە نەریت و گەلەمپەری کۆمەڵایەتی. هەروەها: **بی تربیت**

**بی تفاوت** / bîtafāvot/: [فارسی/ عربی] صفت. بێ گەم: ١. وەکوو یەک؛ بێ جێیاواز؛ بێ تەوفیر؛ پێسەویۆی ‹رفتن وماندنش برایم بی تفاوت است: بوون و نەبوونی لە لام وەکوو یەکە› ٢. [مجازی] بەبێ هەستی باش یان خراپ.

**بی تفاوتی** / bîtafāvotî/: [فارسی/ عربی]/اسم. بێ گەمی: ١. ـها/ بار و دۆخی ئاوڕنەدانەوە لە بەرانبەر شتێ یان کەسێ یان ڕووداوێکەوە ٢. [روان شناسی] لەخۆنامۆیی.

**بی تمیز** / bîtamîz/: [فارسی/ عربی] صفت. [ادبی] بێ هاوێر؛ بە بێ توانینی لێک جیا کردنەوەی باش و خراپ.

**بیتوته** / baytûte/: [عربی]/اسم. بردنە سەر (زیاتر بۆ شەو تا بەیانی)؛ مانەوەی کورت و بە ناچاری لە شوێنێکدا ‹شب را توی ماشین بیتوته کردیم: شەومان لە ماشینەکەدا بردە سەر›.

**بیجا** / bîcā/: صفت. نابەجێ؛ ناجۆر؛ بێ جێگە؛ ناڕەوا؛ نەستێل؛ بێ یاگێ؛ ویجا ‹کار بیجایی کرد: کارێکی نابەجێی کرد›.

▣ **بیجا کردن**: غەڵەت کردن؛ بێجا کردن؛ شەکەرخواردن؛ سەردان لە سەنگ ‹او بیجا می کند که...: غەڵەت دەکا کە...›.

**بیجاده** / bîcāde، ـها/: اسم. بیجادە؛ جۆرە یاقووتێکی سووری ئاماڵ بەنەوش.

**بی جان** / bîcān/: صفت. ١. نەژی؛ بێ گیان. بەرانبەر: **جاندار** (وەکوو خاک و بەرد و...) ٢. مردوو؛ مەردە؛ مردگ؛ گیان دەرچووگ ‹جسد بی جان او را پیدا کردند: لاشەی مردووی ئەویان دۆزیەوە›.

▣ **بی جان کردن**: کوشتن؛ مراندن؛ گیان گرتن.

**بیجک** / bîcak، ـها/: [هندی]/اسم. فاکتۆر؛

بیجەک؛ پتە؛ لاپەڕەیەک کە ناوی فرۆشندە و کڕیار و جۆری کاڵای تێدا دەنووسرێ.

**بی‌جهت** / bîcahat/: [فارسی/ عربی] قید. لەخۆوە؛ بێ‌خۆ؛ بێخود؛ بێ‌ڕابەر ‹بی‌جهت عصبانی شد: لەخۆوە تووڕە بوو›.

**بیچارگی** / bîčāregî، ـها/: اسم. بێچارەیی: ١. بێ‌دەرەتانی؛ دەسەپاچەیی؛ چارەڕەشی؛ بەدبەختی؛ نەبوونی ڕێگە چارە بۆ گیر و گرفتی خۆ ‹برای پیدا کردنت چقدر بیچارگی کشیدیم: بۆ دۆزینەوەت چەندە بێچارەییمان کێشا› ٢. هەژاری؛ نەداری؛ ژاری؛ داماوی؛ مانقیری ‹به بیچارگی ما رحم کنید: بەزەییتان بە هەژاریماندا بێتەوە›.

**بیچاره**[1] / bîčāre، ـها؛ ـگان/: اسم. داماو؛ نسک؛ بێچارە؛ داماگ: ١. نک؛ ناهمێ؛ ناهومێ؛ خاکەسەر؛ پەپۆک؛ کڵۆڵ؛ بەستەزمان؛ بەسەزوان؛ بەسزمان؛ بەسەزمان؛ دەسەوسان؛ دەستەوستان؛ خۆلی سەر؛ ماڵ کامباخ؛ چارەڕەش؛ بەدبەخت؛ قوڕبەسەر؛ قوڕوەسەر؛ هەڕبەسەر؛ لێقەوماو؛ چنەقۆمیا؛ مەهەیر؛ وەزا؛ گری؛ زگورد؛ پەپوویک؛ کەسێ کە تووشی بارێکی ناخۆش هاتووە ‹امروز بیچاره‌ای را آورده بودند که تمام بدنش سوخته بود: ئەمڕۆ داماوێکیان هینابوو کە تەواو لەشی سووتا بوو› ٢. نێچار؛ بێچارە؛ هەژار؛ نچار؛ قوڕەماو؛ بەلەنگاز؛ ژار؛ ڕەجەن؛ ڕوق و ڕەجالنەدار؛ بێ‌دەرفەت؛ بەسەزوان؛ هەڕی‌بەر؛ کەسی داماو و کەمدەست.

**بیچاره**[2]: صفت. بێچارە؛ نێچارە؛ پەپۆک؛ ژار؛ وەزا: ١. داماو لە چارەکردنی ناکۆکی و گیر و گرفتیدا ‹از دست این صاحبخانه بیچاره شدم: لە دەس ئەم خاوەن‌ماڵە بێچارە بووم› ٢. هەژار و نەدار ‹به یک بیچاره بده بپوشد: بیدە بە بێچارەیەک بیکاتە بەری›.

**بی‌چشم‌ورو** / bîčešm-o-rû، ـها/: صفت. [گفتاری] گۆسارتمە؛ بێ‌ڕۆ؛ ساواز؛ ڕووهەڵماڵراو؛ ڕووداماڵیاگ؛ بێ‌چاوەڕۆ؛ بێ‌چاو و ڕوو؛ بێ‌حەیا ‹این نوکر خیلی بی‌چشم‌ورو است: ئەم نۆکەرە زۆر گۆسارتمەیە›.

**بی چون** / bîčûn/: صفت. [ادبی] ١. بێ وێنە؛ بێ‌هاوتا؛ بێ‌هەڤتا؛ بێ‌هاوماڵ؛ بێ‌هاوەڵ؛ بێ‌گۆڕەبا ٢. بە بێ قسە و باس، بێ‌قسە و مشە؛ بێ لە سەر ڕۆشتن؛ بێ‌لێ‌کوتن.

**بی‌چیز** / bîčîz، ـها؛ ـان/: صفت. [گفتاری] بارسووک؛ هەژار؛ نەدار؛ کەرکوڵ؛ دەسکورت؛ دەستەنگ؛ ئاس ‹به خانواده‌های بی‌چیز کمک کنید: بنەماڵەگەلی هەژار یارمەتی بدەن›. هەروەها: **بی‌چیزی**

**بی‌حاصل** / bîhāsel/: [فارسی/ عربی] صفت. بێ‌وەچ؛ بێ‌بەرهەم: ١. بێ‌بەر؛ بێ‌بڕ؛ بێ‌قازانج؛ بێ‌دەسهات؛ بێ‌داهات ‹زمین بی‌حاصل: زەوی بێ‌وەچ› ٢. بێبداوی؛ قیڕۆ؛ بێ‌هۆ؛ گۆترە؛ بێ‌ئەنجام؛ بەدەرد نەخواردوو؛ بێ‌کەڵک؛ بێ‌خۆ ‹کار بی‌حاصل: کاری بێ‌وەچ›. هەروەها: **بی‌حاصلی**

**بی‌حال** / bîhāl/: [فارسی/ عربی] صفت. ١. بێ‌هێز؛ بێ‌هاز؛ بێ‌کەیف؛ ناهاسایی؛ بێ‌مرێس؛ بێ‌میرێس؛ سست؛ ناچاخ؛ بێتاقەت؛ بێ‌هێز و گوڕی پێویست (لە بەر ماندوویی، برسیەتی یان نەخۆشی) ‹این بچه از گرما و تشنگی بی‌حال شد: ئەم منداڵە لەبەر گەرمی و تینوی بێ‌هێز کەوت› ٢. بێ‌ماد؛ بێ‌مرعە؛ مەدلمە؛ خاڤەکێ؛ خاو؛ خلی؛ خاو و خلیچک؛ سست و لەش‌داهێزاو؛ بێ‌تەشە؛ بێ‌لەش؛ بێ‌هێز و پێز و هەنگێزەی کار و تێکۆشان ‹این کارمندان بی‌حال را از کجا جمع کرده‌اند؟: ئەم کارمەندە خاووخلیچکانەیان لە کوێ دۆزیوەتەوە؟›. هەروەها: **بی‌حال شدن؛ بی‌حالی**

▣ **بی‌حال شدن**: بوورانەوە؛ لەهۆش چوون؛ ویەردەیوە.

**بی‌حالت** / bîhālat/: [فارسی/ عربی] *صفت*. بێدەماخ؛ بە بێزرک و زیندوویی و خۆشی ‹صدای بی‌حالت: دەنگی بێدەماخ›.

**بی‌حد**[1] / bîhad/: [فارسی/ عربی] *صفت*. بێئەناز؛ بێشۆ؛ بێگۆڕە؛ بێهەند؛ بێوزە؛ بێژمار؛ بێهەژمار؛ لەژمارەبەدەر؛ لەڕادەبەدەر؛ زیاد لە ئەندازە؛ بێهەی؛ بێپیڤان؛ بەدەر لە پێوان و بەراوەردکردن ‹شادی بی‌حد: خۆشی بێئەناز›.

**بی‌حد**[2]: *قید*. بێشۆ؛ بێئەناز؛ بێژمار؛ بێوزە؛ بێدا ‹بی‌حد خوشحال شدم: بێشو خوشحاڵ بووم›.

**بی‌حد و حساب** / bîhadd-o-hesāb/: [فارسی/ عربی] *صفت*. بێشۆ و هەژمار؛ لە ڕادەبەدەر؛ شتێک وا بە بۆنەی زۆر بوونی، پێومان یا حەسێب نەکرێ ‹پول بی‌حد و حساب: پارەی بێشۆ و هەژمار›. هەروەها: **بی‌حد و حصر**

**بی‌حرف** / bîharf/: [فارسی/ عربی] *قید*. *[گفتاری]* بێچرکە: ۱. بێورتە؛ بێ لام و جیم؛ بەبێ قسە و باس ‹بی‌حرف می‌شود صد تومان: بێچرکە دەبێتە سەد تمەن› ۲. بێ دەنگ؛ وسکوت؛ قڕ؛ قەپ؛ قڕ و قەپ؛ خپ؛ کپ؛ بێخوست؛ بێسەر ‹بی‌حرف بنشین سرجایت: بێچرکە دانیشە لە سەر جێت›.

**بی‌حرکت** / bîharekat/: [فارسی/ عربی] *صفت*. بێجوولە؛ بێجمە؛ نەجووڵ؛ مەندەبوور؛ بێبزاو؛ بێلەپتان؛ نەجڤ؛ بێبزووتن؛ هادار؛ ئادار؛ خپ؛ نەجم ‹دستهایت را بگذار روی سرت، بی‌حرکت: دەستت لە سەر سەرت دانە، بێجوولە›.

▣ **بی‌حرکت بودن**: وەستان؛ نەبزووتن؛ بێجووڵە بوون.

**بی‌حساب** / bîhesāb/: [فارسی/ عربی] *صفت*. ۱. بێهەژمار؛ لە ڕادەبەدەر؛ بێهەند و شۆ؛ هێجگار زۆر ‹پول بی‌حساب خرج شد: پارەیەکی بێهەژمار خەرج بوو› ۲. ناحەق؛ ناڕەوا ‹حرف بی‌حساب نزن: قسەی ناحەق مەکە› ۳. پاک لە پاک ‹قرضت را دادم، حالا بی‌حساب شدیم: قەرزەکەتم داوە، ئێستا پاک لە پاک بووین›.

**بی‌حس** / bîhes(s)/: [فارسی/ عربی] *اسم*. سڕ؛ بێهەست؛ پەنج؛ بێنز: ۱. ئەندامی هەستلێبڕاو ‹پای راستم بی‌حس می‌شود: پای ڕاستم سڕ دەبێ› ۲. مرۆی تەنبەڵی بێغیرەت.

▣ **از سرما بی‌حس شدن**: لە گۆکەوتن/ چوون؛ پەڕین؛ گەلۆ چوون؛ لەمس بوون؛ جە گۆ شیەی.

**بی‌حسی** / bîhessî، ـها/: *اسم*. پەنجی؛ سڕی؛ لەمسی؛ بێهەستی؛ بێنزی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوون یا لەدەسدانی هەستی ئەندامێک لە لەشدا ‹پاهایم دچار بی‌حسی شدند: قاچەکانم لەمس بوون›.

**بیخ** / bîx، ـها/: *اسم*. بن؛ بیژ؛ بنە؛ بێخ: ۱. ڕەگەز؛ پنج؛ پنج و پرزە؛ ڕێخ؛ بنجە؛ بنچین؛ بنچینە؛ بنج و بناوان؛ ڕیشە؛ ڕەگ؛ بنی گیا ‹بیخ درخت: بیخی دار› ۲. پنج و ڕەگ؛ بنواشە؛ بنەچە؛ بنەچەق؛ بنەچەک؛ بنەچەکە؛ ڕەگەز؛ پێز؛ بنڕەخ؛ بنچینە؛ بناخە؛ خیم؛ هیم؛ سۆکین؛ بنەما؛ ماک؛ شەنگستە؛ بن و ڕیشە ‹بیخ و بُن: بیخ و بن› ۳. بنا؛ بنار؛ داجار؛ پنجار؛ خوارترین جێگای شتێ ‹بیخ گوش: بن گوێ›.

▣ **بیخ دیوار**: بنی دیوار.

**بیخ گوش**: بناگوێ؛ پەناگوێ؛ بناگوێچکە؛ بنانگوێ؛ بنەگۆش؛ بنۆگۆشی؛ زۆر نزیک بە گوێوە.

**بیخ گلو**: ناق؛ بناقە؛ بناقاقە؛ بینەقاقە؛

بەربینگ؛ بەربین؛ هەفک؛ ئەوک؛ ستۆکرک؛ تورگ؛ سوکر؛ نیخ؛ بنی گەروو؛ بنی قورگ.

⊡ **بیخ پیداکردن:** ڕەگ داکوتان؛ بنج داکوتان؛ ڕیخێ بەردەی؛ بنەدایەوە؛ بڵاو بوونەوە، پەرە یان گرنگی پەیدا کردن.

**بیخ دندان خاریدن:** *[مجازی]* دیان لێ تیژ کردنەوە؛ مرخ لێ خۆش کردن؛ کەوتنە تەمای شتێکەوە.

**بیخ** / bixe/: *حرف.* بن؛ بنەو؛ بنوو؛ بێخ؛ بێخوو؛ کن: ١. لە نزیک یا لە پاڵ شتێک ‹بیخ دیوار است: لە بنی دیواردایە› ٢. نزیک یا لە پەنای شتێک ‹گذاشت بیخِ دیوار: نایە بن دیوارەوە›.

⊡ **بیخ ریش کسی بستن:** *[مجازی]* کردنە مل کەسێکەوە؛ کردنە ریش کەسێکەوە؛ بە سەر کەسێکدا سەپاندن ‹دخترشان را بیخ ریش یارو بستند: کچەکەیانیان کردە مل کابرا›.

**بیخ ریش کسی ماندن:** *[مجازی]* لە مل/ کۆڵ/ ڕیش نەبوونەوە؛ لە سەر دەست مانەوە ‹لباسها کهنه شده بودند و مانده بود بیخ ریش او: جلەکان کۆنە بوون و بە سەردەستیەوە مابوونەوە›.

**بی‌خانمان** / bîxānemān، ـها؛ ـان/: *صفت.* دەرەندوو؛ بێ‌خان‌ومان؛ بەرەزە؛ پەرتەوازە؛ کۆکم؛ بێ‌ئەنوا؛ دەربەدەر؛ ئاوارە؛ باشیل؛ تراڤیە؛ ترافیە؛ مەرزیر؛ مشەخت؛ لە ماڵ وڵ؛ بێ‌بژیو و پەنا و پەسیو ‹با شروع جنگ بی‌خانمان شدیم: هەر شەڕ هەڵگیرسا دەرەندوو بووین›. هەروەها: **بی‌خانمانی**

**بی‌خبر**[1] / bîxabar/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ١. بێ‌ئاگا؛ بێ‌هاگا؛ بێ‌هەواڵ؛ بێ‌خەبەر ‹مدتی از او بی‌خبر بودم: ماوەیەک لێی بێ‌ئاگا بووم› ٢. ـها؛ ـان// *[مجازی]* نەزان؛ تێنەگەیشتوو؛ گەوج.

**بی‌خبر**[2]: *قید.* بێ‌های؛ بێ‌خەبەر؛ بێ‌پرس؛ بێ‌پەرس؛ هەری؛ لەپڕتا؛ بە چەشنی ناکاو و بێ ئاگا ‹بی‌خبر گذاشت و رفت: بێ‌های لێیدا و ڕۆیشت›.

**بی‌خبری** / bîxabarî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* بێ‌ئاگاداری؛ بێ‌هایی؛ بێ‌خەبەری؛ خافڵی: ١. بار یان چۆنیەتی نەبوونی ئاگاداری ‹ما را در بی‌خبری نگذار: بە بێ‌هایی مەمانهێڵەوە› ٢. *[مجازی]* بێ‌هۆشی؛ لەدەس دانی هووشیاری ‹چهار روز را در بی‌خبری گذراند: چوار ڕۆژی لە بێ‌هاییدا بە سەر برد› ٣. *[مجازی]* نەزانی؛ گەوجی.

**بیختن** / bîxtan/: *مصدر. متعدی.*// **بیختی:** داتبیژا؛ **می‌بیزی:** دادەبێژی؛ **ببیز:** دابێژە// دابێژان؛ دابێژتن؛ بێژان؛ بێژاندن؛ بێتن؛ بێژتن؛ وێژان؛ وێتەی؛ وێچنەی؛ وێژاندن؛ ئاڵەبێژکردن؛ هێڵەک کردن؛ لە هێڵەگ‌دان؛ شتێ (وەک ئارد) لە هێڵەگ یان بێژنگ دان. هەروەها: **بیختنی**

■ صفت مفعولی: **بیختە** (دابێژراو)/ مصدر منفی: **نَبیختن** (دانەبێژان)

**بیختە** / bîxte/: *صفت.* دابێژراو؛ بێژراو؛ بێژنی؛ لە هێڵەگ‌دراو؛ وێژیاو؛ بێژنگ/ هێڵەک کراو؛ وێچیا؛ وێچیەی؛ بەبێژنگ بێژراو.

**بی‌خواب** / bîxāb، ـها/: *صفت.* بێ‌خەو؛ خەوزڕاو؛ بەخەبەر؛ خەوەر؛ خەو لێ نەکەوتوو.

⊡ **بی‌خواب شدن:** خەو زڕان؛ خەو زڕین؛ خەو پەڕین؛ وەرم پرەی؛ لە خەو بێ‌بەش بوون؛ بێ‌بەش بوون لە نووستن.

**بی‌خوابی** / bîxābî، ـها/: *اسم.* بێ‌خەوی؛ بێ‌وەرمی؛ بێ‌خاوی: ١. لە خەو بێ‌بەشی ‹دو شب بی‌خوابی کشیدم: دوو شەو بێ‌خەویم

کێشا› ٢. خەوزڕاوی؛ خەو لێ نەکەوتن و بەخەبەر مانەوە.

**بیخ‌وبن** / bîx-o-bon/: *اسم. [ادبی]* بنج و بناوان: ١. پایە و بن؛ بنەڕەت؛ بنەما؛ بنچینە ‹این کار از بیخ و بن غلط است: ئەم کارە لە بنج و بناوانەوە هەڵەیە› ٢. ڕەگ و ڕیشە؛ ڕیشە؛ ڕیخە؛ ڕیخە و بنە ‹درخت را از بیخ و بن برانداخت: دارەکەی لە ڕەگ و ڕیشەوە هەڵکەند›.

**بی‌خود**[1] / bîxod/: *صفت.* ١. بووراو؛ بێخود؛ بێ‌حاڵ؛ لەهۆش کەوتوو یا لە هۆش چوو ‹از خود بی‌خود شد: لە هۆش خۆی چوو› ٢. بێخۆ؛ بێ کەلک؛ بێ‌داو ‹کار بی‌خود: کاری بێ کەلک› ٣. بێخۆ؛ پووچەڵ ‹حرف بی‌خود: قسەی بێخۆ›.

**بی‌خود**[2]: *قید.* بێ‌هۆ؛ بێ‌خۆ: ١. بێ هۆ و بەڵگە ‹بی‌خود بە تو فحش داد: بێهو جنێوی پێدای› ٢. بە خۆڕایی؛ بەگۆترە؛ گۆترەی؛ بەبێ بەدەسهاتنی بەهرە یا داهاتێک ‹بی‌خود تلاش می‌کنم: بێهو تێدەکۆشم›.

**بی‌خودی**[1] / bîxodî/: *اسم.* بێ‌خەبەری؛ بێخۆیی؛ بێخۆ؛ بار و چۆنیەتی بێخۆ بوون ‹در حالت مستی و بی‌خودی بود: لە حاڵی مەستی و بێ‌خەبەریدا بوو›.

**بی‌خودی**[2]: *قید. [گفتاری]* لەخۆڕا؛ لەخۆوە؛ ویوە؛ ویڵ؛ گۆترەی؛ بێ‌هۆ ‹بی‌خودی از این حرفها نزن: لەخووە ئەم قسانە مەکە›.

**بی‌خیالی** / bîxîyālî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* بێ‌خەیاڵی: ١. بێ‌خەمی؛ گوێ‌نەدەری؛ بێ‌خەفەتی؛ بێ‌کەسەری؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی خەم و پەژارە ‹بچگی دوران بی‌خیالی است: منداڵی سەردەمی بێ‌خەمیە› ٢. کەمتەرخەمی؛ کەترەخەمی؛ بێ‌پەرۆشی؛ بایەخ نەدان بە شتێک ‹این بی‌خیالی کار دستت می‌دهد: ئەم کەمتەرخەمیە

تووشت دەکا›. هەروەها: **بی‌خیال**

**بید** / bîd، ـها؛ ـان/: *اسم.* ١. *[گیاه‌شناسی]* بی؛ بێ؛ وی؛ ڤێ؛ بزوو؛ بیک؛ ویکۆڵ؛ داربی؛ دارەبی ٢. *[جانورشناسی]* مۆرکە؛ مۆرد؛ گازیز؛ قاروونە؛ وەرە؛ جانەوەری وردیلەی خوری خۆر.

▣ **بید خودرو**: بیکۆڵ؛ ویکۆڵ؛ کۆڵەبی؛ دارە بی خۆڕسک.

**بید زرد**: زەردە بی؛ سپیە بی؛ پەلە بی؛ زەربیک: **زردبید**

**بید سرخ**: سوورەبی؛ سوورە ویکۆڵ؛ ویرکۆڵە سوورە: **سرخ‌بید**

**بید سیاه**: ڕەشە بی؛ سیاویرۆڵ؛ سیاویکۆڵ؛ بیە ڕەشە؛ سیابی: **سیاه‌بید**

**بید مجنون**: شۆڕەبی؛ شەنگەبی؛ شینەبی؛ پیتک؛ ماشەبهی.

**بید مشک** ☜ **بیدمشک**

▣ **بید زدن**: مۆرد لێدان؛ وەرەداینە ‹بید زدن لباسها خیلی بە من ضرر رساند: مۆرد لێدانی جلکەکان زوری زەرەر لێدام›.

**بیداد**[1] / bîdād، ـها/: *اسم. [ادبی]* ١. بێداد؛ ستەم؛ گووج؛ ناحەقی کاری ٢. *[موسیقی]* بیداد؛ گۆشەیەک لە دەزگای هومایون لە مووسیقای ئێرانیدا ٣. گاڵە؛ حەشر؛ ئەوپەڕی کارامەیی و لێهاتووی.

**بیداد**[2]: *حرف. [گفتاری]* بێداو؛ بێداد؛ هاوار؛ هایلێ؛ داخ؛ بۆ دەربڕینی ئێش و ئازار ‹آی داد! آی بیداد: هەی داد! هەی بێداد›.

▣ **بیداد کردن**: *[مجازی]* گاڵەکردن؛ حەشر کردن؛ هەراکردن؛ ئەو پەڕی لێهاتوویی و کارامەیی خۆ پیشاندان ‹سرما بیداد می‌کند: سەرما گاڵە دەکا›.

**بیدادگاه** / bîdādgāh، ـها/: *اسم. [کنایی]* دادگای ناحەقی کاری.

**بیدادگری** / bîdādgarî، ـها/: *اسم. [ادبی]*

ستەمکاری؛ گووجکاری؛ ناحەقی کاری؛ ئەستەم کاری؛ بێدادگەری؛ کار یان ڕەوتی ئێش و ئازارگەیاندن بە دیتران، بەتایبەت لە ڕێگەی بەکاربردنی زۆرەوە ‹بیدادگری شیوەی دیرینەی توست: ئەستەم کاری ڕەوشتی کۆنی تۆیە›. هەروەها: **بیدادگر**

**بیدار** / bîdār، ـها؛ ـان/: *صفت.* بەیار؛ بێدار؛ هووشیار؛ وشیار؛ شیار؛ خەوەر؛ خەبەر؛ بەخەبەر؛ ئاگا: ١. نەخەوتوو؛ نەخەفتگ؛ بەهرەمەند لە بێداری ‹از ساعت شش بیدار شدەام: لە ساعەتی شەشەوە بەیار بوومەتەوە› ٢. *[مجازی]* وریا؛ هایە؛ هۆشیار؛ وشیار؛ ئاگادار ‹ملت بیدار است: گەل وریان›.

◘ **بیدار شدن**: ١. لەخەو هەستان؛ وەخەبەر هاتن؛ هەلسان؛ لە خەو ڕابوون؛ ئلەسیاین؛ ئەلسیان؛ هەی بیەیوە؛ وەرمەنە هۆرسەی ٢. *[مجازی]* وشیار بوونەوە؛ ئاگا بوونەوە؛ وریا بوونەوە؛ هەی بیەیوە. هەروەها: **بیدار بودن؛ بیدار کردن؛ بیدار ماندن**

**بیدارباش** / bîdārbāš/: *اسم.* هەلسان؛ هۆرسەی؛ فەرمانی لەخەو هەستان ‹شیپور بیدارباش زدە شد: بۆری هەلسان لێدرا›.

**بیداربخت** / bîdārbaxt/: *صفت. [ادبی]* بەختەوەر؛ بەختیار؛ بەختدار؛ بەهات؛ خودان بەخت.

**بیدارخوابی** / bîdārxābî، ـها/: *اسم.* وریاخەوی؛ سووکەلەخەو؛ بیرەخەو؛ وتەویرە؛ خەوتنی لە سەر هەست و بە ڕاچلەکانی پەیتاـپەیتاوە.

**بیداردل** / bîdārdel، ـان/: *صفت. [ادبی]* زانا؛ ئاگا؛ هاگا؛ دڵزیندوو؛ دلاوەدان؛ ئاگادار؛ ئاوەزیار؛ فەرزانە.

**بیداری** / bîdārî، ـها/: *اسم.* بێداری؛ بەیاری؛ بەخەبەری: ١. بار و دۆخی بەخەبەر بوون ‹بعضی‌ها در بیداری هم خواب می‌بینند: بڕێک لە بیداریشدا خەو دەبینن› ٢. *[مجازی]* وشیاری؛ ئاگایی؛ وریایی ‹روزنامە موجب بیداری مردم می‌شود: ڕۆژنامە دەبێتە هۆی بەیاری خەلک›.

**بی‌دانە** / bîdāne، ـها؛ ـگان/: *صفت.* بێناوک؛ بێ‌دەنوو؛ بێ‌تۆم؛ بێ‌تۆمە؛ بێ‌دان؛ میوەی بێ‌دەنک؛ تایبەتمەندی میوەگەلی ئاوداری دانەیی وەک توو، هەنار و ترێ ‹انگور بی‌دانە: ترێی بێ‌ناوک›.

**بیدخشت** / bîdxešt/: *اسم.* گەزووەبی؛ جۆرە گەزۆیەک کە لە کۆتەرەی بڕێک دار بیەوە دەدەلێ.

**بی‌دردی** / bîdardî، ـها/: *اسم.* بێ‌دەردی؛ بێ‌ژانی؛ بێ‌چلی؛ بێ‌پەرۆشی؛ نەبوونی هەست لە ئاستی ڕووداوی ئازاردەرەوە.

**بی‌درنگ** / bîderang/: *قید.* دەسبەجێ؛ هەرلەجێ؛ ڕێوڕا؛ یەکەوجار؛ بێ‌درەنگ؛ گورج؛ زوو؛ بلەز؛ گورجوگۆل؛ دەستەو لەجێ؛ ئازا؛ جاوەرجا؛ جێبەجێ؛ تافل؛ زوو بە زوو.

**بیدزار** / bîdzār، ـها؛ ـان/: *اسم.* جاڕە بی؛ بی‌جاڕ؛ زەوییەک کە داربیەکی زۆری تێدا ڕوابێ.

**بیدزدە** / bîdzade/: *صفت.* مۆردلێداو؛ مۆرد خواردوو؛ وەرەواردە؛ پێوەر لێکەوتوو بە هۆی مۆردەوە.

**بیدستان** / bîdestān، ـها/: *اسم.* جاڕەبی؛ بی‌جاڕ؛ بیەجاڕ.

**بیدستر** / bîdastar، ـها؛ ـان/: *اسم.* سەگی ئاوی؛ گیاندارێکی مەلەوانە، زیاتر ماسی و ئاوزیان دەخوا.

**بی‌دست‌وپا** / bîdast-o-pā/: *صفت. [مجازی]* سەپۆل؛ سڕ و سەپۆل؛ دەسەپاچە؛ بێ‌دەسەلات؛ بێ‌دەستوپێ؛ بێ‌دەس‌وپل؛ بێ دەستودوو؛ دەست و پێ سپی؛ وز؛ خاو

خلیچـک؛ خـاو و خلیـسک؛ بـی‌زرک و زیتـه‌ڵـی پێویـست لـه کـار و تێکۆشـاندا ‹این شـاگرد تـازه‌ات خیلـی بـی‌دسـت‌وپاسـت: ئـه‌م به‌رده‌سته تازه‌یه‌ت زۆر سه‌پوله›.

**بیـدق** / baydaq، ـها/: [معرب از فارسی]*اسم. [قدیمی]* ۱. په‌یـاک؛ داشـی شـه‌ترنج؛ پیـاده‌ی شه‌ترنج ۲. *[مجازی]* ئـاڵا؛ پـه‌رچـه‌م؛ بـه‌یـداخ؛ به‌یاخ؛ عه‌له‌م.

**بـی‌دل** / bîdel، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* دڵسـووتاو؛ دڵبـه‌سـته؛ ئاشـق؛ ئـه‌ویـنـدار؛ ئـه‌ڤـینـدار؛ بـه‌نـده‌وار ‹دوستان عیب من بـی‌دل حیـران مکُنیـد: یـاران سـه‌رکۆنـه‌ی مـنی دامـاوی دڵسووتاو مه‌که‌ن›.

**بـی‌دم** / bîdom/: *اسم.* کـوڵ؛ قـوڵ؛ کولـه؛ بـێ‌کلـک؛ بـی‌دوو؛ بـێ‌جووچکـه؛ بـێ‌دمـا؛ بێ‌قلیچکه.

**بیدمـشک** / bîdmešk, bîdmešg، ـها/: *اسم.* بیمـشک؛ بیمیـسک؛ شـابی؛ شـاویرۆڵ؛ بی شه‌که‌رێ؛ جـورێ بیـه، گوڵـی سـپی بونخـۆش ده‌کا.

**بیـدمـشکی**[1] / bîdmeškî, bîdmešgî/: *اسم.* زه‌ردی تێر؛ زه‌ردی تۆخ؛ جۆره ڕه‌نگێکه.

**بیدمشکی**[2]: *صفت.* به ڕه‌نگی زه‌ردی تۆخ.

**بی‌دنـدان** / bîdandān/: *اسم.* کـه‌پ؛ کـه‌پـن؛ کـاڵ؛ کـه‌لکالـه‌ی؛ کۆلـوس؛ کـه‌لخـۆت؛ بـێ‌ددان؛ بـێ‌دیـان؛ ده‌مبـه‌تـاڵ؛ ده‌مپێـک؛ ده‌مچۆڵ.

**بیـده** / bîde، ـها/: *اسم.* بیـده؛ لـه‌گـانێکی گجکـه کـه شـێرێکی وه‌ک فـواره‌ی پێـوه‌یـه و بـۆ شـۆردنی لای خـوارووی لـه‌ش (تـارەت گرتن) ده‌بێ.

**بـی‌دیـن** / bîdîn، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بێ‌ئۆل؛ بێ‌دیـن؛ دڵ‌کۆچـه‌ر؛ بـێ‌بـڕوا بـه دین ‹یک نفر بـی‌دیـن را کـرده بودنـد معلم تعلیمات دینـی: بـی‌دینێکیـان کردبـووه مامۆسـتای دینی›. هه‌روه‌ها: **بی‌دینی**

**بیراه** / bîrāh/: *صفت.* ۱. نـادرووس؛ خـراو ‹پُر بیـراه نمـی‌گوید: فـره‌یـش خـراو نـایژێ› ۲. لاڕێ؛ لاکـدا؛ ڕێ‌چـه‌وت؛ ڕێگـۆڕ؛ گومـڕا ‹آدم بیراهـی است: پیاوێکی لاڕییه›.

**بیراهه** / bîrāhe، ـها/: *اسم.* بێـڕێ؛ بێـڕا؛ لاڕێ؛ چـه‌پـه‌ڕێ: ۱. ڕێگایـه‌ک کـه (لـه بـه‌ر دووری یـان نـاجووری) هـات‌وچـووی زۆر دژواره ‹از بیراهـه گریخـت: لـه لاڕیـوه بـۆی ده‌رچـوو› ۲. *[مجازی]* کـار و ڕه‌وتی تـووش بـوون یـان تێـدا چـوون ‹ایـن جـوان بیراهـه مـی‌رود: ئـه‌م لاوه بـه لاریدا ده‌ڕوا›.

▣ **بیراهه رفـتن:** *[مجازی]* بـه لاڕێـدا چـوون؛ هه‌ڵـه چـوون؛ هـه‌ڵـه‌کـردن؛ لـه‌ڕێ لادان؛ ڕێ هه‌ڵه‌کردن.

**بیراهــه‌رو** / bîrāherow/: *اسـم. [مجـازی]* هه‌ڵه‌شه؛ له‌ڕێ لاده‌ر.

**بیـرق** / bayraq، ـها/: [ترکـی]*اسم. [قـدیمی]* به‌ندێر؛ ئاڵا؛ په‌رچه‌م؛ به‌یداخ؛ به‌یاخ؛ عه‌له‌م.

**بـی‌رگ** / bîrag/: *صـفت. [گفتـاری]* بێـره؛ بـێ‌ڕه‌گ؛ بـێ‌غـیره‌ت ‹آدم هـم ایـن قـدر بـی‌رگ پیـدا مـی‌شـود؟: کـه‌سـێکی وه‌هـا بـی‌غیره‌ت کـوا هه‌یه؟›.

**بـی‌رمـق** / bîramaq/: [فارسـی/ عربـی] *صفت.* بـێ‌هێـز؛ شـل‌وکـوت؛ شـه‌ل‌وپـه‌ت؛ بـێ‌هـاز؛ بـێ‌ده‌سـت‌ودوو؛ بێتـقاب؛ بـێ‌تـه‌شـه ‹بـی‌رمق افتادم: شل‌وکوت داکه‌وتم›.

**بـی‌رواج** / bîravāc/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت.* نقت؛ بێ‌بره‌و؛ بێ‌بره‌و؛ بێ‌ڕمێن.

**بـی‌رواجـی** / bîravācî/: [فارسـی/ عربـی]*اسم.* مالـه‌ڤـین؛ بـێ‌بـره‌وی؛ نـقتی؛ بـێ‌ڕمـێنی؛ که‌سادی.

**بـی‌رودربایـستی** / bîrûdarbāyestî/: *قیـد.* ڕاسـت‌بڕاسـت؛ ڕاسـته و ڕاسـت؛ ڕووت و ڕاسـت؛ ڕه‌پ و ڕاسـت؛ پـان بـه پـان؛ بـه بـێ

مەرایی و شەرم و شوورەیی‌کردن.

**بیرون** /bîrûn/، ـهـا/:/سم. دەرەوە؛ دەرەڤە؛ ئەودەر: ١. دەر؛ بەر؛ بەرەوە؛ دەرڤە؛ دەرەو؛ ئەوبەری سنووری دیاریکراو لە چوارچێوەی باس یان مەبەستێکدا ‹از بیرون هم برای کمک آمده بودند: لە دەرەوەش بۆ یارمەتی هاتبوون› ٢. بەرەوە؛ دەرڤە؛ ئەو بەری دیوار یان کەمەرەیەک کە ئەو بەرەکەی‌تری گیراوە. بەرانبەر: **درون؛ تو** ‹از بیرون بهتر دیده می‌شود: لە دەرەوە باشتر دەبیندرێ› ٣. بەر؛ دەشت؛ دیو دەشت؛ بەشێ لە شتێک کە دەبیندرێ ‹بیرون خانه را رنگ کرده بودند: دەرەوەی ماڵەکەیان ڕەنگ کردبوو› ٤. */مجازی/* دەردەیشت؛ کۆڵان یان شەقام ‹بیرون چه خبر؟: چ خەبەر لە دەرەوە؟› ٥. */کنایی/* دەس‌ئاو؛ دەساو؛ دەس‌بەئاو؛ کناراو ‹از صبح سه دفعه بیرون رفته بود: لە بەیانیەوە سێ‌جار ڕۆیشتبووە دەرەوە›.

**بیرون**[۲]*: قید.* دەرەوە؛ بەرەوە؛ دەرڤە؛ دەشت؛ دەرۆ؛ دەرەو: ١. بەر؛ بۆ لای دەرەوە یا پێچەوانەی ژوورەوە. بەرانبەر: **تو** ‹برو بیرون: بچۆ دەرەوە› ٢. دوور لە ماڵ یان جێگای هەمیشەیی ‹شب را بیرون خوابید: شەو لە دەرەوە نووست›.

▣ **بیرون آمدن:** هاتنەدەر؛ هاتنە دەرەوە؛ دەرهاتن؛ بەرئامەی؛ ئەرەزیەی: ١. هاتنە دەشتەوە؛ دەرکەوتن ‹از خانه بیرون امدن: لە ماڵ هاتنە دەر› ٢. واز هێنان لە کار یان شوێنێک ‹از آن اداره بیرون امدم: لەو مەزرینگەیە هاتمە دەرەوە›.

**بیرون آوردن:** دەرهێنان؛ دەرهاوردن؛ دەرئانین؛ بەرئاردەی ‹دستش را از جیبش بیرون اورد: دەستی لە گیرفانی دەرهێنا›.

هەروەها: **بیرون بردن؛ بیرون ریختن؛ بیرون کشیدن**

**بیرون انداختن:** خستنە دەرەوە؛ وەدەرنان؛ دەرکردن؛ هەڵقەتاندن؛ دەرخستن؛ بەرکەردەی؛ وسەی بەر؛ ئەرەزنیەی ‹او را از خانه بیرون انداخت: لە ماڵ حستیە دەرەوە›.

**بیرون جهیدن:** دەرپەڕین؛ دەرفرتان؛ پەڕینە دەرەوە؛ بەرپڕەی ‹از سوراخش بیرون جهید: لە کونەکەی دەرپەری›.

**بیرون راندن:** قەشتاندن؛ قەشتین؛ هەڵفرتاندن؛ وەدەرنان؛ دەرکردن؛ کردنە دەشتەوە؛ بەرکەردەی؛ ئەرەزنیەی؛ بەسووکایەتی دەرکردن.

**بیرون رفتن:** چوونە دەرەوە؛ ڕۆیینە دەرەوە؛ لوەی بەر: ١. دەرکەوتن؛ زیایرە؛ شیوەبەر؛ ڕۆیشتن بۆ دەرەوەی شوێنێکی قۆرخ ‹از اتاق بیرون رفت: لە دیوەکە چووە دەرەوە› ٢. واز لە شتێک یان جێگاییک هێنان ‹از بازی بیرون رفت: لە کایەکەدا چووە دەرەوە› ٣. */گفتاری، کنایی/* چوونە دەس‌ئاو؛ بۆ کناراو چوون.

**بیرون زدن:** هەڵتۆقان؛ هەڵتۆقین؛ هەڵپۆقین؛ هەڵزرەپان؛ هەڵزیپان؛ دانە دەرەوە؛ هۆرتەقەی؛ ئەوەزیەی؛ زیایوە ‹قارچ از زمین بیرون زد: کارگ لە زەوی هەڵتوقی›.

**بیرون شدن:** وەدەرکەوتن؛ ڤەدەرکەتن؛ لە شوێنێک هاتنە دەرەوە ‹از شهر بیرون شدم: لە شار وەدەرکەوتم›.

**بیرون کردن:** ١. ڤەدەی‌کردن؛ وەدەرنان؛ دەرکردن؛ کردنە دەرەوە؛ بەرکەردەی؛ ئەرەزنیەی؛ زنایرە ‹آزاد را از خانه بیرون کرد: ئازادی لە ماڵ دەرکرد› ٢. دەرهێنان؛ هێنانە دەر؛ هاوردنە دەرەوە، بەرئاردەی؛ ئەوەزنیەی ‹سرش را از پنجره بیرون کرد: سەری لە پەنجێرەکەوە دەرهێنا›.

**بیـــرون کـــشیدن**: دەرکێـــشان؛ کێـــشانە دەرەوە؛ کێـــشانە دەر؛ بـــەرکێـــشتەی؛ کرێـــشەیـــش؛ کـــڕانتش؛ دەرهێنـــان لـــە شوێنی خۆی.

**بیـــرون‌بـــر** / bîrûnbar، ـهـا/: اسم. [گفتاری] چەرچی؛ وردەواڵەفرۆش؛ دێوەرە؛ پیلەوەر.

**بیرونـی**[1] / bîrûnî، ـهـا/: اسم. [قـدیمی] هێـرە؛ دری؛ درین؛ بـەشێک لـە خانووبـەرەیـەک کـە بـە وێـدا دەچنـە ژوورەوە ‹در بیرونـی نشـسته بودیم کـه خبـر آمـد...: لـە هێـرە بـووین کـە هـەواڵ گەیشت...›.

**بیرونـی**[2]: صـفت. دەرەکـی؛ دەرەوەیـی؛ دەروو؛ بـەریـن؛ دەرینـە؛ دەری؛ دەریـن؛ بـەرینـە: ١. پێوەندیـدار یـان سـەر بـە دەرەوە ‹علـل بیرونـی: هۆگـەلی دەرەکـی› ٢. دەشـتـن؛ دەشـتـین؛ لـە دەرەوە ‹دیوار بیرونی: دیواری دەرەکی›.

**بـی‌رویـه** / bîravîyye/: [فارسـی/ عربـی] صـفت. بـێ‌ڕەوشـت؛ بـێ‌بنـەمـا؛ بـێ‌ڕێـچ یـان ڕێ‌وشوێنی لەبـار ‹بـا ایـن رفتـار بـی‌رویـه کـه تـو داری، آخـر از مدرسـه بیرونـت مـی‌کننـد: بـەم کـارە بـێ‌ڕەوشـتانە تـۆ هـەتـە، ئـاخری لـە قوتابخانـە دەرت دەکەن›.

**بـی‌ریخـت** / bîrîxt/: صـفت. [گفتـاری] ناحـەز؛ دزێـو؛ دشـت؛ نالـەبـار؛ نابـار؛ نابـاو؛ گـورگ‌نـەخـۆرە؛ کرێـت؛ بـێ‌نـژم؛ ناشـیرین ‹لباسش بـی‌ریخـت بـود: جـل‌وبـەرگـەکـەی، ناحـەز بوون›.

**بـــی‌ریـــا** / bîryā/: [فارســی/ عربــی] صــفت. دڵـساف؛ دڵـپاک؛ بـێ‌گـەرد؛ ڕاسـت و پـاک؛ بێ‌گرێ و گۆڵ.

**بیـز** / bîz/: [کـردی] اسـم. بیـز؛ بێـز؛ قیـز؛ گـرخ ‹بیزم آمد: قیزم شێواوە›.

**بیـزار** / bîzār/: [از کـردی] صـفت. بێـزار؛ وەڕەز؛ جاڕز؛ جارس؛ عێدر؛ بێ‌مـەعـد؛ وێـڕس؛ کـەرخ ‹از این کار بیـزارم: لـەم کـارە وەڕەزم›. هـەروەهـا: بیزار بودن؛ بیزار شدن؛ بیزار کردن

**بیـزاری** / bîzārî، ـهـا/: [از کـردی] اسم. بێـزاری؛ وەڕەزی؛ جـاڕزی؛ وێڕسـی؛ کـەرخـی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی بـێ‌واز بـوون لـە بـەرانبـەری کەسێک یان شتێکەوە.

▣ **بیـــزاری جـــستن**: ڕوو وەرگێـــڕان؛ دوورە پـەرێـزی گـرتن؛ پـشت هـەڵـکردن؛ پـشت تێکـردن؛ دووری گـرتن ‹در همـەی آن سـالها از سیاسـت بیـزاری مـی‌جـست: لـە تـەواو ئـەو ساڵانەدا لە سیاسەت ڕووی وەردەگێرا›.

**بـی‌زبـان** / bîzabān، ـهـا؛ ـان/: صفت. بـێ‌زوان؛ بـێ‌زمـان: ١. بـێ توانـای قسەکـردن ‹بچـەی بـی‌زبـان را گرسـنه گذاشـتی و رفتـی: ئـەو منالـە بێ‌زوانـەت بـە برسـی بـەجـێ هێـشت و ڕۆیـشتی› ٢. [مجازی] بێ‌دەم و زمـان؛ نـەگۆمـە؛ بـێ توانـا و زاتی دەربـڕینی مـەبـەسـت و قـسەی خـۆ ‹این قدر بی‌زبـان نبـاش، حرفـت را بـزن: ئـەوەنـدەش بێ‌دەم و زمان مەبە، قسەکەت بکە›.

**بـــی‌زحمـــت** / bîzahmat/: [فارســـی/ عربـــی] حـرف. بـێ‌زەحمـەت؛ تکایـە؛ زەحمـەت نـەبـێ؛ بـێ‌زامـەت؛ وتـەیـەک بـۆ خوایـشت‌کـردن بـە واتای: «ئەگەر بۆتـان زەحمـەت نیـە» ‹بـی‌زحمـت آن کتـاب را برداریـد: بـێ‌زەحمـەت ئـەو کتێبـە هەڵگرن›.

**بیزن** / bîzan/: اسم. [قدیمی] بێژنـگ؛ وێچنـێ؛ ئامرازی دابێژان.

**بیزنـده** / bîzande/: اسم. بـژ؛ دابـژ؛ دابێـژەر؛ وێچنـەر؛ کـەسـێ کـە ئـارد یـان دەخـڵ بـە بێژنگ دادەبێژێ.

**بـی‌سـابقه** / bîsābeqe/: [فارسـی/ عربـی] صـفت. بـێ‌وێنـە؛ بـێ‌مانـەنـد؛ بـێ‌سـابقە؛ نـەبـوو: ١. بێ‌ڕابـردوو؛ بـێ‌هاوتـا لـە ڕابـردوودا ‹ایـن کـار بی‌سابقه است: ئـەم کـارە بـێ‌وینـەیـە› ٢. [مجـازی] بـێ‌گـۆڕەبـا؛ زۆر سـەرسـووڕێنەر ‹عروسیـشان بی‌سابقه بـود: زەمـاوەنـدەکـەیـان بـێ‌وینـە بـوو› ٣.

زۆر و زەبەند ‹برف بی‌سابقه: بەفری زور و زەبەند›.

**بیسار** / bîsār/: ضمیر. فیسار؛ فیسارکەس؛ کەس یا شتێ نەناسراوی دوایی ‹فلان و بیسار: فلان و فیسار›: **بیستار** *[ادبی]*

**بی‌سامان** / bîsāmān/: *صفت. [ادبی]* شێواو؛ شێویا؛ شێویاگ؛ شڵەژاو؛ تێکچوو؛ ناکۆک؛ ئاڵۆز ‹زندگی بی‌سامان: ژیانی شیواو›.

**بی‌سامانی** / bîsāmānî. ـها/: *اسم.* شێواوی؛ ئاڵۆزی؛ بێ سەرە و بەرەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شڵەژاوی ‹مگر تو ما را از این بی‌سامانی نجات بدهی: مەگەر تۆ لەم ئاڵوزیە دەربازمان کەی›.

**بیسبال** / baysbāl/: [انگلیسی]*اسم. [ورزش]* بەیسباڵ؛ تۆپ‌قاڕ؛ قارێن؛ نان‌نانێن؛ جۆرێک یاریە بە تۆپێکی چکۆلە کە بە دارێک پێیدا دەدەن و کێ بیگرێتەوە.

**بیست** [1] / bîst/: *اسم.* بیست؛ بیس؛ ویست؛ ویس؛ ڤیس: ١. ژمارەی دوای نۆزدە و پێش بیست‌ویەک ٢. باترین نمرە لە فێرەگەی ئێراندا ‹امروز بیست گرفتم: ئیمڕۆ بیستم وەرگرت›.

⊡ **بیست گرفتن**: بیست وەرگرتن؛ ویس گێرتەی؛ گرتنی باشترین نمرە.

هەروەها: **بیست آوردن؛ بیست دادن**

**بیست** [2]: *صفت.* بیس؛ بیست؛ ویس؛ ڤیس: ١. زۆر باش؛ بێ کەم و کووری ٢. بیسەم؛ بیستەم؛ ویسەم.

**بیست ـ** [3]: *پیشواژە.* بیست‌ـ؛ ویس‌ـ؛ ڤیس‌ـ؛ بیس‌ـ؛ بە بیست ئەندامەوە ‹بیستروزه: بیس‌ڕۆژە›.

**بیستار** / bîstār/ ☜ **بیسار**

**بی‌ستاره** / bîsetāre. ـها/: *صفت. [مجازی]* ڕۆژڕەش؛ بەوبەخت؛ بەدبەخت؛ سیابەخت؛ بەخت‌کوێر؛ چارەڕەش ‹ما آدمهای بی‌ستاره دنبال چه می‌گردیم؟: ئێمەی ڕوژرەش بەشوێنی چیداین؟›.

**بیسترو** / bîstro. ـها/: [؟]*اسم.* چەشنێک چێشتخانە کە هەموو چێشتەکانی بە یەک نرخ دەفرۆشێ.

**بیست‌سوآلی** / bistso'āli/: [فارسی/ عربی] ☜ مسابقەی بیست سوآلی، **مسابقه**

**بیستم** / bîstom/: *صفت.* بیستەم؛ ویسەم؛ بە پلە، ڕیز یان جێگەی بیستەوە ‹ردیف بیستم: ڕیزی بیستەم›.

**بیستمی** / bîstomî/: ضمیر. بیستەمی؛ ویسەمین؛ ئەوەی لە ڕیز، پلە یان جێگەی بیستەمەوەیە ‹بیستمی مال من: بیستەمی بۆ من›.

**بیستمین** / bîstomîn/: *صفت.* بیستەمین؛ ویسەمین؛ لە پلە، ڕیز یان جێگەی بیستەمدا.

**بی‌سرپوش** / bisarpuš/: *صفت.* سەربەتاڵ؛ سەرئاوەلا؛ دەفر یان هەر شتێکی بێ‌سەر.

**بی‌سر و پا** / bîsar-o-pā. ـها؛ ـیان/: *صفت.* بێ سەر و پا؛ بێ سەر و پێ؛ شەلات؛ شەللات؛ لات؛ چەوەرە؛ خۆڕی و تۆڕی؛ بێکارە و خوێڕی؛ هیچەکە و پووچەکە؛ گەجەرگوجەر؛ بێ‌کەسایەتی و بڕی جڤاتی.

**بی‌سر و ته** / bîsar-o-tah/: *صفت.* بێ سەر و بن؛ بێ‌سەرە و بنە؛ بێ‌سەر و بەر: ١. ناتەواو؛ کەموکورت؛ کەموکووڕ؛ کەمهاتوو؛ کەل؛ بێ‌سەر و قن ‹کارهای بی سر و ته: کاری بێ‌سەر و بن› ٢. شپرزە؛ شێواو؛ شێویاگ؛ کەچوکوور ‹حرفهای بی‌سر و ته: قسەی بێ‌سەر و بن›.

**بی‌سر و زبان** / bîsar-o-zabān/: *صفت.* لاڵوپاڵ؛ لاڵوتات؛ بێ‌دەنگ و بێ سەر و زمان.

**بی‌سر و سامان** / bîsar-o-sāmān/: *صفت.* بێ‌سەر و بەر؛ ژیان ناڵەبار ‹دهر بسیار چو من

بـی سروسـامان دیـده‌سـت: جیهـان زۆری بـه‌خـۆوه دیوه وه‌ک من بێ سه‌ر و به‌ر›.

**بـــی‌ســر و صـــدا**[1] / bîsar-o-sedā/: [فارسـی/ عربـی] صفت. ١. بـێ‌ده‌نـگ؛ خـت؛ خـپ؛ کـوپ؛ کپ؛ بێ‌خورت؛ بێ سـه‌ر و سـه‌دا ‹جـای بـی‌سر و صدا: جێگه‌ی بـێ‌ده‌نـگ› ٢. ـ‌ـهـا/ بـێ هـه‌را و هوریا؛ بێ‌هـه‌را و مـه‌زات؛ بـێ‌گـرم و قـاڵ؛ بـێ قه‌رقه‌شه؛ بێ‌چه‌قه و هـه‌را؛ بـێ‌چـه‌قـه و گـوڕه ‹کارهای بی‌سروصدا: کارگه‌لی بێ‌هه‌را و هوریا›.

**بی‌سروصـدا**[2]: قید. بـێ‌ده‌نـگ: ١. بـێ‌خوسـت ‹ماشـین بـی‌سر و صـدا کـار مـی‌کند: ماشـینه‌کـه بـێ‌خوسـت کـار ده‌کـا› ٢. [مجـازی] بـێ‌چرکـه؛ بێ‌کرچه؛ بێ‌کشه؛ به‌په‌نامـه‌کـی؛ بـه‌بـێ‌ده‌نگـی ‹بـی‌سروصـدا کـارش را مـی‌کنـد: بهبـێ‌چرکـه کاره‌که‌ی ده‌کا›.

**بیـــسکویت** / bîskuvît، ـهـــا/: [انگلیـــسی/ فرانسوی] اسم. هنـدۆک؛ بـسکویت؛ پـسکیتی؛ گه‌رگه‌ری.

**بـــی‌ســکه** / bîsekke/: [فارسـی/ عربـی] صـفت. [کنایی] ١. برۆ؛ ترۆ؛ ترماڵ؛ بـێ‌بایـه‌خ؛ بـێ‌بـه‌هـا ‹بیچـاره دامـاد را بکلـی بـی‌سـکه کردنـد: زاوای بێچـاره‌یـان بـه‌تـه‌واوی تـرۆکرد› ٢. بـێ‌بـره‌و؛ بێ‌تیشک؛ بـێ‌بریقـه؛ بـێ‌بازاڕگـه‌رمـی ‹کـارش بی‌سکه شد: کاره‌که‌ی بێ‌بره‌و بوو›.

**بیـــسموت** / bîsmût/: [فرانـسوی از آلمـانی] اسـم. بیـسمووت؛ تـوخمێکی کیمیـاوی کـانزایی، بـه ژمـاره‌ی ئـه‌تـومی ٨٣ و کێـشی ئـه‌تـومی ٢٠٨,٩٨.

**بـی‌سـواد** / bîsavād، ـهـا؛ ـان/: [فارسـی/ عربـی] صـفت. ١. نـــه‌خوێنـــده‌وار؛ نـــه‌خـــوه‌نـــه‌وار؛ نه‌خوێنـده؛ نـه‌خوێنـدی؛ نـه‌خۆنـده؛ ناخونـده؛ نـه‌خۆنـدی؛ نـه‌خۆنـه؛ نـه‌خانـدی؛ نـه‌وانـا؛ نێوه‌نـدا؛ بـه‌بـێ توانـای خوێنـدن و نووسین و هـه‌ژمـارکردن ٢. [مجـازی] بـێ‌زانـست؛ نـاوارد؛ بێ‌سیوات؛ بێ زانـستی بـه‌س یـان بـاش ‹دبیر فیزیک مـا خیلـی بـی‌سـواد بـود: مامۆسـتای فیزیکـی ئێمه زۆر بێ‌زانست بوو›.

**بـی‌سـوادی** / bîsavādî/: [فارسـی/ عربـی] اسم. نه‌خوێنده‌واری؛ نه‌وانایی؛ بێ‌سیواتی.

**بـی‌سیرت** / bîsîrat/: [فارسـی/ عربـی] صـفت. ١. بـێ‌ئاکـار؛ بـێ‌ئـه‌خـلاق؛ گرێجـان ‹از ایـن آدم بی‌سیرت همـه‌چیـز مـی‌خیـزد: لـه‌م کـابرا بـێ‌ئاکـاره هـه‌مـوو شـتێ ده‌بێتـه‌وه› ٢. [گفتـاری] بـێ‌بـن؛ بـێ‌بنـه؛ بـێ‌کچـێنی ‹دختـر بیچـاره را بُـرد و بی‌سیرت کـرد: کچـه دامـاوه‌کـه‌ی بـرد و بـێ‌بنـی کرد›.

**بیـسیک** / baysîk/: [انگلیسی] اسم. بـه‌یـسیک؛ له زمانگه‌لی به‌رنامه‌نووسی کۆمپیوته‌ر.

**بیـــسیکلت** / bîsîklet، ـهـا/: [فرانـسوی] اسـم. دووچه‌رخه؛ بایسیکڵ.

**بی‌سیم** / bîsîm، ـهـا/: اسم. بێ‌سیم؛ تـه‌لسز؛ برووسـکه؛ تـه‌لـه‌فـۆنی بـێ‌تێـل؛ بێتـه‌ل؛ کـــه‌ره‌ســـته‌ی ڕه‌وانـــه‌کـــه‌ری پێلـــی ئێلێکترۆمێغناتیـسی کـه بـێ پێویـستی بـه سیم کار ده‌کات.

**بـی‌سـیم‌چـی** / bîsîmčî، ـهـا؛ ـان/: [فارسـی/ ترکـی] اسم. بـێ‌سـیمچی؛ برووسـکه‌چـی؛ کـه‌سـێ کـه کـاری، دامـه‌زرانـدنی پێـوه‌نـدی بـــێ‌ســـیم و وه‌رگـــرتن و نـــاردنی په‌یامه‌کانیه‌تی.

**بیش**[1] / bîš/: صفت. [ادبی] زۆر؛ بـێ؛ بێـرا؛ فـره؛ زیـاد؛ فـیش؛ فـێش؛ زه‌حـف؛ زاف؛ زێـده ‹که در شـب بـیش باشـد درد بیمـار: کـه بـه شـه‌و ئێـشی نه‌خۆش زۆرتر ئه‌بێ›.

**بیش**[2]: قید. [ادبی] زۆر؛ فـێش؛ فـره ‹بـیش گفت و اندک شنید: زۆری گوت و که‌می بیست›.

▣ بیش از پیش: زۆرتـر لـه پێشوو؛ فـره‌تـر لـه جاران؛ زۆرتر له ڕابردوو.

**بیـشتر**[1] / bîštar/: صـفت. زۆرتـر؛ پتـر؛ زیـاتر؛ بێتـر؛ بتـر؛ هـه‌نی؛ هۆنـده؛ فێـشته‌ر؛ زافتـر؛

فره‌تەر؛ زافێر؛ زێدەتر؛ شلشل؛ ئێلاڵی ‹پول بیشتر می‌خواست: پارەی زۆرتری ئەویست›.

**بیشتر**[2]: *قید.* زۆرتر؛ پتر؛ زافتر؛ زێدەتر؛ زیاتر؛ هنافیشی؛ فیشر؛ ئێلاڵێ؛ شلشل ‹او را بیشتر زد: لەوی زۆرتر دا›.

**بیشترین** / bîštarîn/: *صفت.* زۆرترین؛ فرەترین؛ فێشتەرین؛ زێدەترین؛ بە گەورەترین هەژمار یان چەندێتییەوە ‹بالاخره توانست بیشترین نمره را در کلاس بگیرد: ئاخری توانی زۆرترین نمرەی پۆلەکە بگرێ›.

**بیش تیماری** / bîštîmārî/: *اسم. [روانشناسی]* دۆخ یان چۆنیەتی چاوەدێری و پێراگەیشتنی لەڕادە بەدەر.

**بی‌شرم** / bîšarm/: *صفت.* بێ‌حەیا؛ بەڕوو؛ رووداماڵاو؛ رووهەڵماڵاو؛ شەرمتکاو؛ گۆسارتمە؛ سێ‌بەندی؛ بێچاو و روو؛ بەقلیسۆک؛ کەلپزا؛ قوڵتەش؛ قوڵتەشە؛ کوڵەش؛ رووقایم؛ قرشماڵ؛ دەلوقەل؛ بێ‌ئاوروو؛ بێ‌ڕۆ؛ بێ‌عار؛ باتیزک؛ باتیزۆک؛ سەرنەوق؛ رووتەخت؛ دۆقدۆقە؛ چەقەسۆ؛ چەتاوەسۆ؛ چارداوەروو؛ چەتاوەروو.

**بی‌شعور** / bîšo'ûr/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بێ‌ئاوەز؛ بێ‌یەوڵ؛ بێ‌گورد لە وەرگرتن یان رێکوپێک کردنی دروستی پەیامگەلی وەرگیراو بە مێشکی خۆ (وەک خاس و خراپ یان ڕاست و چەوت) ‹آدم بی‌شعور کارش را می‌سپارد دست شخص ناشی: مرۆی بێ‌ئاوەز، کاری خۆی بە نەزانکار دەسپێرێ›.

**بی‌شفقت** / bîšafaqqat, bîšafeq(q)at/: [فارسی/ عربی] *صفت.* دڵرەق؛ دڵ‌هەشک؛ بێ‌بەزەیی؛ دوور لە ڕوحم و بەزە ‹طالع بی‌شفقت بین کە در این کار چە کرد: چاو لە بەختی دڵرەقم کەن چی بە من کرد لێرەدا›.

**بی‌شک** / bîšak/: [فارسی/ عربی] *قید.* بێ‌گومان؛ بێ‌شک؛ بێ‌دوودڵی؛ بێ‌دردۆنگی؛ بێ‌ڕوێز؛ بێ‌سۆ؛ بە شێوەی مسۆگەر ‹بی‌شک او می‌داند کە تو اینجایی: بێ‌گومان دەزانێ کە تۆ لێرەی›.

**بی‌شمار** / bîšomār/: *صفت.* بێ‌ژمار؛ بێ‌شومار؛ بێ‌ئەژمار؛ بێ‌هەژمار؛ یەکجار فرە؛ لە ژمارە بەدەر؛ یەکجار زۆر؛ زێدە لە بژاردن ‹گروه بی‌شمار: گرۆی بێ‌ژمار›.

**بیشه** / bîše، ـها/: *اسم.* بێشە؛ مێشە؛ بیش؛ وتیشە؛ دەوەن؛ شیخەڵ؛ شخەڵ؛ شەخەڵ؛ چوغور؛ چغور؛ دەحل؛ لێڕ؛ لێڕەوار؛ لێنی؛ تەرت؛ کواشە؛ زاناف؛ قاڕوون؛ جێگەی پڕ دار و دەوەن.

▣ **بیشه‌ی انبوه**: بێشەلان؛ مێشەلان؛ شەخسال؛ شەخەلان؛ شەخەلە؛ پەرچ؛ هورمان؛ کنف؛ چڕ؛ قومشەڵ؛ قەرەم؛ بێشە و قامێشەلانی پڕ.

**بیشینه** / bîšîne/: *اسم.* زۆرینە؛ زۆربە؛ ئەوپەڕ؛ زۆرترین ڕادە لە شتێ کە لە دەستدایە ‹بیشینه‌ی حقوق دریافتی: زۆرینەی مووچەی وەرگیراو›.

**بیشینه‌سازی** / bîšînesāzî، ـها/: *اسم.* زۆرینەسازی؛ کار یان ڕەوتی گەیاندن بە زۆرترین ڕادە.

**بی‌صاحب** / bîsāhab/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بێ‌خاوەن؛ خۆنە؛ بەرەڵا؛ بەرهەڵدا.

**بی‌صاحب‌مانده** / bîsāhabmānde، ـها/: [فارسی/ عربی/ فارسی] *دعا. [گفتاری]* خاوەن مردوو (جۆرێ جنێوە بە واتای: بەڵکوو خاوەنی بمرێ) ‹آن دست بی‌صاحب مانده رابکش کنار: دەستی خاوەن‌مردووت لابە›.

**بی‌صبری** / bîsabrî، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم. [گفتاری]* ١. نائارامی؛ بێ‌نتمی؛ بێ‌هێمنی؛ بێ‌ئوقرەیی ٢. پەلە؛ لەز؛ هەشتاو؛ گورج؛ تێزە؛ خێرا ‹با بی‌صبری نامه را باز کرد: بە پەلە نامەکەی کردەوە›. هەروەها: **بی‌صبر**

**بی‌صدا**[1] / bîsedā/: [فارسی/ عربی] صفت. بێ‌دەنگ؛ بێ‌کش: ١. نەبزێو؛ خپ؛ کپ ‹حرف بی‌صدا: پیتی بێ‌دەنگ› ٢. /ـها/ بێ‌چرکە؛ قەپ؛ قرِ و قپ؛ قورِ و قەپ؛ قەپ و قرِ؛ نەملیچ؛ کش؛ پس؛ پست؛ کپەنە؛ بێ‌گریچ؛ بێ‌هەست و خۆست ‹اسلحەی بی‌صدا: چەکی بێ‌دەنگ›.

**بی‌صدا**[2]: قید. بێ‌دەنگیێ؛ بێ‌دەنگ؛ بە بێ‌دەنگی؛ بە قرِ و قەپی؛ بێ‌چرکە؛ بێ‌کشە؛ بێ‌هەلەبەل ‹از اتاق بی‌صدا بە بیرون رفت: لە دیوەکە بێ‌دەنگی رۆیشتە دەرەوە›.

**بی‌صفت** / bîsefat/: [فارسی/ عربی] صفت. *[گفتاری]* بێ‌ئەمەگ؛ ئەمەگ‌نەناس؛ سپڵە؛ بێ‌وەفا ‹شریکش خیلی بی‌صفت بود: شەریکەکەی زۆر بێ‌ئەمەگ بوو›.

**بیضتین** / bayzatayn/: [عربی]/اسم. گونان؛ گورنان؛ گونێ؛ هەر دوو هێلکەگون.

**بیضوی**[1] / bayzavî، ـها/: [عربی]/اسم. هێلکەیی؛ هێلەیی؛ هێکەل.

**بیضوی**[2]: صفت. هێلکەیی؛ هێکەلی؛ لە تەرزی هێلکە؛ هێلکەئاسا: **بیضی‌گون**

**بیضه** / bayze، ـها/: [عربی]/اسم. گون؛ گورن؛ خایە؛ خا؛ هێک؛ حەوێنجی؛ هیلکەگون؛ هێلەگون؛ هێکەی‌گون؛ بەشێک لە ئەندامی زا و زێی بربرِەدارانی نێرینە کە تۆماو چێ‌دەکات و لە مرۆڤدا بە بیچمی دوو هێلکەی گچکە لە ناو کیسەیەکدان.

**بیضه‌بند** / bayzeband، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. خایەبەن؛ خایەبەند؛ کیسەیێک بە دوو بەندەوە کە گونانی تێدەخەن و دەبەسترێتە دەوری کەمەرەوە بۆ پاراستنی گون لە داهێزان یان پێدا دان.

**بیضی** / bayzî، ـها/: [عربی]/اسم. بەیزی؛ هێلکەیی؛ جەغزئاسای درێژۆکەی لە بیچمی هێلکەی تەخت‌کراو، بە دوو خاڵی ناوەندی(کانوون)ەوە.

**بیضی‌گون** / bayzîgûn/: [عربی/ فارسی] ☜ **بیضوی**[2]

**بیطار** / baytār، ـها/: [معرب از یونانی]/اسم. بەیتال؛ بژیشکی ئاژەڵ.

**بیطاری** / baytārî/: [معرب]/اسم. بەیتاڵی: ١. پیشەی بەیتاڵی ٢. *[قدیمی]* بژیشکی ئاژەڵ.

**بی‌طرف** / bîtaraf، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. بێ‌لایەن؛ لاتەریک؛ گوێ‌دینج؛ نێتار ‹من در این دعوا بی‌طرفم: من لەم شەرِەدا بێ‌لایەنم›.

**بی‌طرفانه**[1] / bîtarafāne/: [فارسی/ عربی/ فارسی] صفت. بێ‌لایەنگری؛ بێ‌لایەنانە ‹داوری بی‌طرفانە: داوەری بێ‌لایەنگری›.

**بی‌طرفانه**[2]: قید. بێ‌لایەنگری؛ بێ‌لایەنانە ‹او بی‌طرفانە حکم داد: بێ‌لایەنگری بریاری دا›.

**بی‌طرفی** / bîtarafî، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. بێ‌لایەنی؛ نێتاری ‹بی‌طرفی مادرم باعث شد تا دعوا زود تمام شود: بێ‌لایەنی دایکم بووە هۆی ئەوە کە شەرِەکە زوو کۆتایی پێ بێت›.

**بی‌ظرفیت** / bîzarfîyyat/: [فارسی/ عربی] صفت. کەم‌جیقڵدان؛ تەنگەجیقڵدان؛ بێ‌گەپرووگ ‹نباید با آدم بی‌ظرفیت شوخی کرد: نابێ لەگەڵ مرۆی کەم‌جیقڵداندا گاڵتە بکەێ›.

**بیع** / bay'/: [عربی]/اسم. *[فقه، حقوق]* ١. سەودا؛ مامەڵە؛ سەندن و فرۆتن ٢. کار و رِەوتی کرین؛ سەندن؛ سانەی؛ ئەسەی.

▣ **بیع سلف/ سلم**: سەلەم؛ پێشکرِ؛ پێشخرِ؛ رِووبێدە؛ سەندنی داهات پێش خەرمان بە پارەیەکی کەمتر.

**بیع شرطی**: سەودای بەشەرت؛ مامەڵەی بەستراو بە یەک یان چەند مەرجی‌ترەوە.

**بیع قطعی**: سەودای بێ‌شەرت؛ مامەڵەی

تەواوکراو کە تازە تێک نادرێتەوە، مەگەر بە خواستی کڕیار و فرۆشیار پێکەوە.

**بی‌عار** / bî'ār/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بێ‌عار؛ بێ‌شەرم؛ گەوەند؛ گەڤەندە؛ بێ‌ئاورووو؛ شڵفت؛ پنتی؛ لمتی؛ بەبێ هەستی تەریقەو بوون ‹پسرش خیلی بی‌عار بود و اصلا دنبال کار نمی‌رفت: کوڕەکەی زۆر بێ‌عار بوو، هەر بە شوێن کاردا نەدەڕۆیشت›.

**بی‌عاری** / bî'ārî، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* بێ‌عاری؛ گەوەندی؛ شڵفتی؛ ساوازی: ١. نەبوونی کەسایەتی کۆمەڵایەتی ‹اعتیاد بی‌عاری می‌آورد: گیرۆدەیی بێ‌عاری دێنێ› ٢. بایەخ نەدان بە ئەرزشگەلی پەسن‌کراوی کۆمەڵ ‹از بی‌عاری شوهرش بە خشم آمده بود: لە بێ‌عاری شووەکەی گیانەسەر ببوو›.

**بیعانه** / bay'āne، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* بێعانە؛ بەیعانە؛ عەرەبون؛ ئربوول؛ پێشەکی سەودا؛ پارەیێک کە کڕیار لە پێشەوەی وەرگرتنی کالا، بە فرۆشەری دەدات.

**بیعت** / bay'at، ـها/: [عربی]/*اسم. [اسلام]* خۆ سپاری؛ سەرسپێری؛ ڕاژێری؛ پەیمانی فەرمانبەری و سەرسپێری.

▣ **بیعت کردن:** سەر سپاردن؛ خۆ سپاردن؛ هاتنە بەر فەرمان؛ ڕاژێرکردن.

**بیعت گرفتن:** ڕاژێرگرتن؛ پەیمانی سەرسپێری لە خەڵک وەرگرتن بۆ کەسێک.

**بی‌عرضگی** / bî'orzegî، ـها/: [فارسی/ عربی/ فارسی]/*اسم.* بێ‌قابلی؛ ناکارایی؛ تەوەزەلی؛ خێتی؛ ختی؛ خوتەلی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی کار لێهاتن.

**بیغ** / bîq، ـها/: *صفت. [گفتاری]* ١. بڵح؛ گەمژە؛ گەنەژە؛ هیچنەزان؛ وڵحە؛ گێل و وێل؛ گێل‌گەوج؛ جلخۆز ‹این شاگرد بیغ، جانم را بە لبم رساندە: ئەم شاگردە بڵحە گیانەسەری کردم› ٢. بێ‌خەم؛ بێ‌خەفەت؛ بێ‌خەیاڵ ‹علی بیغ است و عین خیالش نیست: عەلی بێ‌خەمە و بای خەیاڵیشی نیە›.

**بیغوله** / bayqûle، bîqûle، ـها/: *اسم.* ١. پەسیو؛ قوژبن؛ گۆشە؛ پەنا؛ داخمە؛ دەخمە؛ شوێنی تررووسک و تاریک ‹اسم این بیغولە را گذاشتەای اتاق؟: نێوی ئەم پەسیوەت ناوە دیو؟› ٢. کەلاوە؛ کەلار؛ کەلارە؛ کەلێن؛ کەلاوەکۆن؛ کەلاوەکۆنێ؛ کاولەکۆن؛ وێرانە؛ تەپخگە؛ خەپەڵگا ‹شب را بە بیغولەای پناه بردند: شەو پەنایان بردە کەلاوەیەک›.

**بی‌غیرت** / bîqayrat/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بێ‌غیرەت؛ خوێڕی؛ بێڕەهـ ؛ بێ‌ڕەگ؛ بێ‌دەمار.

**بیفتک** / bîftek/: [فرانسوی از انگلیسی] ☜ **اِستِیک**

**بی‌فکر** / bîfekr/: [فارسی/ عربی] *صفت.* سەرچڵ؛ بێ‌فکر؛ سەرسەری ‹شوهرش خیلی بی‌فکر است: شووەکەی زۆر سەرچڵە›.

**بی‌فکری** / bîfekrî، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* بێ‌فکری؛ سەرچڵی: ١. بایەخ نەدان بە ئەرکی خۆ ‹بی‌فکری تو ما را بە این روز انداخت: بی‌فکری تۆ ئێمەی خستە ڕۆژێکی ئاوەها› ٢. نەبوونی دووربینی و خۆپارێزی ‹بی‌فکری تو باعث شد بیایند و خانە را خالی کنند: سەرچڵی تۆ بووە هۆی ئەوە کە بێن و ماڵەکە گەسک لێدەن›.

**بی‌قابلیت** / bîqābelîyyat/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ١. ☜ **ناقابل** ٢. لێ‌نەهاتوو؛ نالایق ‹آدم بی‌قابلیت: بنیادەمی لینەهاتوو›.

**بی‌قدر** / bîqadr/: [فارسی/ عربی] *صفت.* چرووک؛ بێ‌ئەرزشت؛ بێ‌بایەخ؛ بێسە؛ بێ‌نرخ؛ بێ‌قیمەت ‹با رفتن پیش مقامات خودش را بی‌قدر کرد: کە چووە لای سەرزلەکان خۆی چرووک‌کرد›.

**بـی‌قـرار** / bîqarār/: [فارسی/ عربی] *صفت.* نائـارام؛ بێ‌ئـوقره؛ بـێ‌هـەدا؛ گـل و گـوێز؛ بێ‌هێمنی ‹دیشب خیلی بی‌قرار بود: دوێنێ‌شەو زۆر نائارام بوو›.

**بـی‌قـراری** / bîqarārî، ـهـا/: [فارسی/ عربی] *اسم.* بێ‌قارایی؛ بێ‌وەقـرەیـی؛ بـێ‌ئـوقرەیـی: ۱. پـەشـۆکاوی؛ بـێ‌هـەدایـی؛ بـێ‌تاقـەتی؛ بـار و دۆخـێ کـە بـە هـۆی نیگـەرانی و پـەشـێوی، هـەدای زەیـن تێـک ئـەدا و ئـەبێتـە هـۆی ئاکـاری نـەویـستی وەکـوو هـەڵـسان و دانیـشتن و ڕوانـین بـۆ هـەرلایـەک ‹مادرش خیلی بی‌قراری می‌کرد: دایکـی زۆر بـی‌قارایی ئـەکـرد› ۲. گلـو گـوێزی؛ بـار و دۆخ و چۆنیـەتی لـە دەسـدانی ئـارام و ئـۆقره ‹قدری با تحمل باش، گریه و بی‌قراری چه فایده‌ای دارد؟: کەمێ خۆڕاگر بە، بی‌وەقرەیی بـە کـەڵکی چـی دێ؟›.

**بی‌قـواره** / bîqavāre/: [فارسی/ عربی] *صفت.* نـەپـۆڕ؛ ناڕێـک؛ نـاقۆلا؛ بـێ‌نـژم؛ بـێ‌دیامـان؛ بەوقەلافەت ‹هیکل بی‌قواره: گۆڤدەی نەپور›.

**بـی‌قـوت‌لایمـوت** / bîqûtelayamût/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بێـزەواد؛ بـێ‌نـان و بژیـو؛ بەبێ نانی وشک.

**بـی‌قیـاس** / bîqiyās/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[ادبی]* بـێ‌ئـەنـاز؛ یـەکجـارفره؛ بـێ‌شـۆ؛ بێ‌هەژمار؛ بێ‌وزە؛ بـێ‌پیـڤان؛ بێحـەد؛ فـراوان ‹شکر بی‌قیاس: شوکریبی‌نەناز›.

**بـی‌قیـد** / bîqayd/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ۱. بەرەلا؛ نەگـرتی؛ نـەشـاش؛ بـەردایـی؛ خـوویی ‹رفتـار بـی‌قیـد: ئاکـاری نـەگـرتی› ۲. کـەمتـەرخـەم؛ کـەتـرەخـەم؛ گـوێ‌نـەدەر؛ کـارپـشت‌گـوێ‌خـەر ‹آدم بـی‌قیـد: بنیـادەمـی کەمتەرخەم›.

**بی‌قیـدی** / bîqaydî، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* کەمتەرخەمی؛ کەترەخەمی؛ گوێ‌نەدەری.

**بـی‌قیمـت** / bîqaymat/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[گفتـاری]* بـێ‌بایـەخ؛ بـێ‌نـرخ؛ بێـسە؛ بێ‌ئەرزشت؛ بێ‌قیمەت.

**بیک** / bayk/: [ترکی] ☜ **بیگ**

**بیکـار**[1] / bîkār، ـها؛ ـان/: *اسم.* بێکـار؛ بـەتـاڵ؛ دەسـبەتـاڵ؛ دەسـتبـەتـاڵ؛ قـاله؛ گـەبـەر؛ بێکان؛ مازۆر؛ بەتاڵ پـا ‹یک نفر بیکار پیدا کن، بیایـد کمکـت کنـد: بێکارێـک پـەیـدا کـە، بـێ یارمەتیت بدا›.

**بیکـار**[2]: *صفت.* ۱. بێکـار؛ بـێ‌کـرد وکـاش ‹دو روز است ماشین بیکار است: دوو ڕۆژە ماشـینەکـە بێکـارە› ۲. بێکـار؛ گـەبـەر؛ دەسـتقـالا؛ دەستـقاله؛ مـازۆر؛ بـێ‌پیـشه ‹آزاد بیکـار شـده است: ئازاد بێکـار بـووە› ۳. بـاهێر؛ بایـەر؛ بـێ‌بـڕ؛ بـێ‌کـاروەری و بـەهـرەدار بـوون ‹زمـین بیکـار: زەوینی بـاهیر›. هـەروەهـا: **بیکـار بـودن؛ بیکـار شدن؛ بیکار کردن؛ بیکار ماندن**

**بیکـارگی** / bîkāregî/: *اسم.* بـەرەڵـدایی؛ کـەتـوەری؛ تـەپلمۆسـی؛ قـەوچلیـەتی؛ خوێڕیـەتی ‹وقـتش را بـه تنبلـی و بیکـارگی می‌گذراند: کاتی بە خوێریەتی بە سەر ئەبا›.

**بیکـاره** / bîkāre، ـهـا/: *صفت.* تـەوەزەل؛ بێکـارە؛ قـەوچـل؛ جلنبـۆڕ؛ پاتـاڵ؛ کـەتـوەر؛ مـەلاس: ۱. تـەمـەڵ؛ بێفرشـک؛ لـەش‌گـران؛ پـەلـشت؛ شـل‌وول؛ شـل و شـەوێـق؛ تـڕاڵ؛ تەپلۆس؛ کارنـەخـواز ‹من شاگرد تنبل و بیکاره نمی‌خواهم: مـن شـاگردی تـەمبـەڵ و نـەوەرەڵـم ناوێـت› ۲. تـەپلمـۆس؛ کارلـێ‌نـەزان؛ کـار لـە دەسـت نـەهـاتوو؛ هـیچ لـێ‌نـەهـاتوو؛ بـە بـێ‌لێهـاتوویی و کارامـەیـی پێویـست بـۆ شەمیراندنی هەر چـەشـنە کارێکی بایـەخدار ‹آدم بیکاره: مرۆی تـەوەزەل›. هـەروەهـا: **بیکـاره بودن؛ بیکاره شدن**

**بیکـاری** / bîkārî، ـها/: *اسم.* بێکـاری: ۱. بـار و دۆخی نەبـوونی کـار ‹بیکـاری کسالت و خـستگی

مـی‌آورد: بیکاری، وەرەزی و مانـدوویی دینـێ› ٢. بەتالی؛ وەرزێر وچان؛ کـاتی وچـان؛ هـەبوونی گـوردی کـار ‹وقت بیکـاری: کـاتی بیکـاری› ٣. دەرکران یان بێبەش بوون لە پیشە ‹بحران اقتصادی موجب بیکاری کارگران شده است: قەیرانی ئابووری بووەتە هۆی بیکاری کرێکاران›.

▣ بیکاری پنهان: بێکاری پەنامەکی؛ بێکاری نادیار؛ کاری بێبەرهەم؛ جۆرێک بێکاری کە کرێکار کار دەکا، بەڵام دەسهاتی نیە.

**بیکاری فصلی**: بێکاری وەرزی؛ بێکاری ئەوانەی کە کاریان وەرز و چاخی تایبەتی خۆی هەیە (وەک قوتابیان و ماسیگران).

**بـی‌کـران** / bîkarān/: صفت. [ادبی] ١. بێسنوور؛ بێپەڕ؛ بێدوایی؛ بێگامە؛ بێنا؛ بێپەراوێز ‹اقیانوس بی‌کران: زەریای بێسنوور› ٢. بێبرانەوە؛ بێدوایی؛ بێکۆتایی ‹احسان بی‌کران: چاکەی بێبرانەوە›.

**بـی‌کـس** / bîkas، ـان/: صفت. بێکەس؛ بێخزم و کار؛ بێکەس و کار؛ بێخزم و خێزان یان هەواڵی نزیک. هەروەها: **بی‌کس بودن؛ بی‌کس شدن؛ بی‌کس ماندن**

**بـی‌کـسی** / bîkasî، ـها/: اسم. بێکەسی؛ بێخزم و کەسی؛ بێکەس و کاری ‹بی‌کسی بد دردی است: بێکەسی دەردێکی گرانە›.

**بـی‌کفایـت** / bîkefāyat/: [فارسی/ عربی] صفت. ١. بێڕاوێژ؛ بێبەراورد ٢. لێنەهاتوو؛ لێنەهاتگ؛ بێقابل ‹مسئول بی‌کفایت: بەرپرسی لێنەهاتوو›.

**بـی‌کفایتی** / bîkefāyatî، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. بێڕاوێژی؛ بێبەراوردی؛ بار و دۆخ و چۆنیەتی بێڕاوێژ بوون ‹بی‌کفایی مدیر مدرسه موجب این فاجعه شد: بێڕاوێژی بەرپرسی قوتابخانەکە، بووە هۆی ئەم کارەساتە›.

**بـی‌کـلاس** / bîkelās/: [فارسی/ فرانسوی] صفت. [گفتاری] بی‌کلاس؛ بێتایبەتمەندییەکی بەرچاو و گرنگ ‹با این آدمهای بی‌کلاس دمخور نمی‌شوم: لەگەڵ ئەم بنیادەمە بێکلاسانە هۆگر نابم›.

**بـی‌کلـه** / bîkalle/: صفت. [گفتاری] کەللەشەق؛ سەرەخەر؛ بێمێشک؛ بێمەژگ؛ خرپوو؛ بێ خۆپاریزی و دووربینی ‹آزاد در جوانی خیلی بی‌کله بود: ئازاد لە جوانیدا زۆر کەللەشەق بوو›.

**بـی‌کـم‌و‌کاسـت** / bîkam-o-kāst/: صفت. پربەپڕ؛ ئازگار؛ بێکەم و کووری؛ بێکەم و کورتی؛ بێکەم و کرچی؛ بەبێ زیاد و کەم.

**بیـگ** / bayg، ـها/: [ترکی] اسم. بەگ؛ بێگ؛ ئاغا؛ سەرناوی ئاغاوات.

**بیگـاری** / bîgārî، ـها/: اسم. بێگاری؛ زەود؛ سۆژە: ١. کاری بە زۆر و بێ مز ‹روستاییان را به بیگاری می‌برند: گوندنشینانیان دەبردە بیگاری› ٢. [مجازی] کار و زەحمەتێ کە هیچ قازانجی نیە ‹من از صبح تا شب در این خانه بیگاری می‌کنم: هەر لە بەیانیەوە تا شەو لەم ماڵەدا بیگاری دەکەم›.

**بیگـانگی** / bîgānegî، ـها/: اسم. نامۆیی؛ بێگانەیی؛ بیانەیی؛ چۆنیەتی نەناس و نامۆ بوون.

**بیگانه**[1] / bîgāne، ـها؛ ـگان/: اسم. بێگانە؛ بیانی؛ بێوارە؛ نامۆ؛ نەناس؛ نەنیاس؛ نەژناس؛ لاوەکی؛ لاپرە؛ بەڕانی؛ لایدە؛ گەجە؛ گەچە؛ دورڤەیی؛ دەرەکە؛ دەرەگە؛ هاقی؛ غەوارە؛ خەریوە؛ غەریبە: ١. کەسێ کە خەڵکی وڵات، بازێڕ یا گەڕەکێک نیە ٢. کەسێ کە ئەندامی کۆمەڵ یان گرووپێک نیە.

**بیگانه**[2]: صفت. بێگانە؛ بیانی؛ بێوارە؛ نەناس؛

لاوەکی؛ نامۆ؛ لاپرە؛ بەڕانی؛ گەجە؛ گەچە؛ دورڤەیی؛ غەیارە؛ غەوارە؛ دەرەکە؛ دەرەگە؛ هاڤی: ١. پێوەندیدار یان هی ولاتێکی دیکە ‹زبان بیگانە: زمانی بیگانە› ٢. پێوەندیدار بە دەرەوەی کۆمەڵەیەکی دیاریکراو. بەرانبەر: **خودی** ‹ما دختر بە بیگانە نمی‌دهیم: ئێمە کچ بە بیگانە نادەین› ٣. ناناشنا یا بێ‌پەیوەندی ‹کاملا با هنر بیگانە است: بە تەواوی لەگەڵ هونەردا بیگانەیە›. هەروەها: **بیگانە بودن؛ بیگانە شدن؛ بیگانە ماندن**

**بیگانەپرست** / bîgāneparast، ـها؛ ـان/: *صفت.* بێگانەپەرست؛ نیشتمانفرۆش؛ خۆخۆر؛ دژمنی گەل و نەتەوەی خۆی.

**بیگانەخوار** / bîgānexār، ـها؛ ـان/: *اسم. [زیستشناسی]* بێگانەخۆر؛ ناموۆەر؛ خانۆکەیەک کە دەوری ماکی بیانی دەدا و لە ناوی دەبا (وەک گولوبوولی سپی خوێن).

**بیگانەخواری** / bîgānexārî/: *اسم. [زیستشناسی]* کار یان ڕەوتی گەمارۆدان و لە نێو بردنی ماکی دەرەکی بە هۆی بێگانەخۆرانەوە.

**بیگانەستیز** / bîgānesetîz، ـها؛ ـان/: *صفت.* دژەنامۆ؛ دژنامۆ. هەروەها: **بیگانەستیزی**

**بیگانەگریز** / bîgānegorîz، ـها؛ ـان/: *صفت.* نامۆبێز؛ خۆ لە نامۆ پارێز. هەروەها: **بیگانەگریزی**

**بیگاه** / bîgāh/: *اسم. [ادبی]* ١. بێ‌گاڤ؛ بێ‌گاو؛ بێ‌تان؛ بێ‌دان؛ ناوەخت ‹تا زسر بیرون کنیم این خفتن بیگاه را: تا لە سەرمانی دەرکەین ئەم نووستنە بێ‌گاڤە› ٢. درەنگان؛ دێر؛ کاتی دێرتر لە وەختی دیاریکراو.

**بی‌گدار** / bîgodār/: *قید.* هەڕەمە؛ هاکۆ: ١. گۆترە؛ بێ‌هەڵسەنگاندنی ئاست و هەڵوێست ٢. بێ دانەپەی؛ بێ گەڕان بە دوای ڕێیی شیاودا.

▣ **بی‌گدار به آب زدن:** بێ فوو لە دۆ کردن، خۆ تێ‌کوتان؛ کاری هەڕەمە کردن.

**بیگزاده** / baygzāde/: [ترکی/ فارسی] *اسم. [قدیمی]* بەگزادە.

**بی‌گل** / bîgol/: *صفت.* بێ‌گوڵ؛ گیای بەبێ‌گوڵ.

**بی‌گلبرگ** / bîgolbarg/: *صفت.* بێ پەڕەگوڵ؛ گوڵی بە پەڕەگوڵی وەک گەڵاوە.

**بیگلربیگی** / bîglarbaygî، ـها/: [ترکی] *اسم. [قدیمی]* بیگلەربەیگی: ١. پلەیەک لە زنجیرەی پلەگەلی ئێڵی بارتەقای جێ‌نشینی ئێڵخان ٢. سەرۆک یان فەرماندەی هێزی چەکداری ولاتێک.

**بیگم** / baygom/: [ترکی] *اسم. [قدیمی]* خان؛ خاتوون؛ خاتوو؛ خات؛ خانم؛ نازناوی ڕێزداری بۆ ژنان ‹خدیجە بیگم: خەجێ خان›.

**بیگمان** / bîgomān, bîgamān/: *قید.* بێ‌سۆ؛ بێ‌گومان؛ بێ‌ڕوێز؛ بێ‌شک ‹بیگمان فردا می‌رود: بی‌سو بەیانی دەڕوا›.

**بی گناه** / bîgonāh/: *صفت.* بێ تاوان؛ ناتاوان؛ بێ‌گونا؛ ناگوناح؛ بێ‌سووچ.

**بیگودی** / bigudî، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* بیگوودی؛ کەرەسەیەکی گرۆڤەری گچکە لە کانزا یان پەلاستیک، بۆ لوول‌کردنی قژ.

**بیل** / bîl، ـها/: *اسم.* مەرە؛ بێمەرە؛ پامەرە؛ پێمەرە؛ مەرک؛ مەڕگ؛ مەڕبێر؛ مەربێل؛ بێر؛ خاکەناز؛ خاکەناس؛ بێل؛ بێڵە؛ باڵە.

▣ **بیل آهنی:** بێلاسن؛ بێڵی ئاسن.

**بیل باغبانی:** مانک؛ بێڵی بچووک بۆ سەوزی چاندن.

▣ **بیل زدن:** بێڵ لێدان؛ بێڵ کەردەی؛ بە بێڵ کارکردن ‹یک کارگر صدا کن بیاید این

باغچه را بیل بزند: کارگەرێک بانگ کە با بێت باغچەکە بیل لێ‌بدات›.

**بیلاخ** / bilāx/: [ترکی] صوت. *[مستهجن]* شیڕ؛ شڕ؛ جڕت؛ وشەیەکە بۆ گوتنی ولامی نە و بە نیشانەی نەیاری، لەگەڵ نیشاندانی قامکە گەورەی دەسدا ‹بیلاخ! تو خیال می‌کنی من هم مثل تو خرم: شیڕ! تۆ وادەزانی منیش وەک خۆت کەرم›: **بیلخ**

**بیلان**/ bîlān، ـها/: [فرانسوی از ایتالیایی] اسم. بەراوەرد: ۱. *[حسابداری]* سیایی دەخڵ و خەرج؛ ڕیزی دەخڵ و خەرج ۲. ڕاپۆرتی کاری ئەنجامدراو، لە یەک ڕێکخراوەدا بۆ کاتێکی دیاریکراو.

**بیلچه** / bîlče، ـها/: اسم. بێڵچە؛ بێڵکار؛ کولبە؛ نالجاج؛ بێرک؛ مانک؛ کەرد؛ پێمەڕۆکە؛ بێلوکهێ؛ بێلۆچکە؛ پێمەڕی چکۆلە.

**بیلخ** / bilax/: [ترکی] ☜ **بیلاخ**

**بیلخور** / bîlxor/: اسم. کەتەن؛ پابێڵ ‹این زمین سفت است، بیلخور ندارد: ئەم زەمینە ڕژاکە، کەتەنی نیە›.

**بیلدار** / bîldār، ـها؛ ـان/: اسم. بێڵکار؛ بێڵکەر؛ کاریگەرێ کە بە بێڵ کار دەکا ‹چهار تا بیلدار بگیر، بده زمین را بیل بزنند: چوار بێلکار بگرە، با زەویەکە بێڵ لێدەن›.

**بیل‌زن** / bîlzan، ـها؛ ـان/: اسم. بێڵکار؛ بێڵکەر؛ کەسێ کە بە بێڵ کار دەکا.

**بی‌لطف** / bîlotf/: [فارسی/ عربی] صفت. ۱. بێ‌شەوق؛ بێ‌ئازاف ۲. نامێهرەبان؛ سەرسەنگین ‹تازگیها نسبت به من خیلی بی‌لطف شده‌اید: ماوەیەکە لەگەڵمدا زۆر نامیهرەبانن›.

**بیلک** / bîlak/: اسم. *[قدیمی]* بێرک؛ جۆرێک پەیکانی پانی دوو سەر.

▣ **بیلک گیاه‌کنی**: پیشکان؛ گیاکەن؛ پیشک؛ پاچەکۆڵە؛ دار یان بێلۆکەی گیا هەڵقەندن.

**بیلک وجین**: بژارچین؛ گیاکەن؛ ئاسنۆکێکی کلک‌داری دەم پانە کە گیای بژاری پێ هەڵدەکەنن.

**بیلکاری** / bîlkārî/: اسم. بێڵکاری؛ پێمەڕەکاری؛ مەردان؛ کار بە پێمەڕە.

**بیلیارد** / bîlyārd/: [از فرانسوی] اسم. بیلیارد؛ یاریەکی دووکەسی لە سەر مێزە کە بە چێوێک تۆپ لێکدەدەن و دەکونی چوار سووچی مێزەکەی دەخەن: **بلیارد**

**بیلیون**/ bîlyon/: [فرانسوی/ انگلیسی] ☜ **ملیارد**

**بیم** / bîm، ـها/: اسم. *[ادبی]* ترس؛ تەرسی؛ بیم؛ سامی؛ سەهم؛ هەراسە؛ ئەنێش؛ ئەندێشە؛ ئەندێش؛ هاس؛ خۆف؛ باک ‹بیم مرگ: ترسی مەرگ›.

▣ **بیم دادن**: ترساندن؛ گوڕەشەکردن؛ هەڕەشەکردن؛ تەرسنەی؛ گەف‌کەردەی.

**بیم داشتن**: نیگەران بوون؛ ترسان؛ ترسیان؛ ترس لێ‌نیشتن؛ تەرسەی؛ سامی‌کەردەی؛ هەستی ترس‌کردن.

**بیمار**[1] / bîmār، ـها؛ ـان/: اسم. نەخۆش؛ نەوەش؛ نەوەشە؛ ژاندار؛ ژانۆ؛ نارەحەت؛ لەش‌بەبار؛ دەردەدار؛ بێمار؛ نەساز؛ ناساغ؛ نەساغ؛ نەساخ؛ ناساخ؛ ناساز؛ خەستە؛ دەرداوی؛ دەردبار؛ دەردین؛ نەوەسە: ۱. گیاندارێ کە بڕێک لە ئەندامەکانی لەشی تووشی ناساغی هاتوون ۲. کەسێ کە بە هۆی نەخۆشیەوە، لە ژێر چاوەدێریدایە و دەرمان دەکرێ.

▣ **بیمار اورژانس**: نەخۆشی کەلەلا؛ نەخۆشی بەترەف؛ نەخۆشێک کە پێویستە زوو فریای کەون.

**بیمار بستری**: نەخۆشی ناوجێ؛ نەخۆشێ کە ناتوانێ هەستێ و دەبێ پێی ڕابگەن.

**بیمار درونی**: بنا و بویژ؛ دەغەزدار؛ لە دەروونەدا ناساز؛ دڵنەخۆش.

**بیمار سرپایی**: نەخۆشی سەرپێیی؛ نەخۆشێک کە بەبێ شەو مانەوە لە نەخۆشخانە، چاری کاری دێ.

**بیمار مردنی**: ژار و ژەنگ؛ نەخۆشی لە مردن؛ نەخۆشی لە سەرە مەرگ.

▣ **بیمار شدن**: نەخۆش کەوتن؛ نەخوەش کەفتن؛ نەخۆش بوون؛ ژانین؛ نەوەش کەوتەی.

**بیمار**[۲]: *صفت*. دەردەدار؛ نەخۆش؛ نەوەش؛ نەساز؛ تووشی نەخۆشی بوو ‹مغز بیمار: مێشکی نەخۆش›. هەروەها: **بیمار بودن؛ بیمار شدن**

**بیمارداری** / bîmārdārî، ـهـا/: *اسم*. نەخۆشیاری؛ چاودێری کردنی نەخۆش. هەروەها: **بیماردار**

**بیمارستان** / bîmārestān، ـهـا/: *اسم*. نەخۆشخانە؛ خەستەخانە؛ تیمارخانە.

▣ **بیمارستان اختصاصی**: نەخۆشخانەی پسپۆڕی؛ خەستەخانەیەک کە بۆ دەرمانی بڕێک نەخۆشینی تایبەتی تەرخان کراوە.

**بیمارستان خصوصی**: نەخۆشخانەی تایبەتی؛ خەستەخانەی نادەوڵەتی.

**بیمارستان دولتی**: نەخۆشخانەی دەوڵەتی.

**بیمارستان روانی**: نەخۆشخانەی ڕەوانی.

**بیمارستان سیار**: نەخۆشخانەی گەڕۆک؛ نەخۆشخانەی لە سەر ماشێن و ناو خێوەت، بە هەموو جۆرە پێویستییێکەوە، بۆ پێراگەیشتن بە نەخۆشان لە جێی خۆیاندا.

**بیمارستان صحرایی**: نەخۆشخانەی دەشتی؛ نەخۆشخانەی سارایی؛ نەخۆشخانەی دامەزراو لە نێو خێوەتان بۆ یارمەتیدانی لێقەوماوانی شەڕ و بوومەلەرزە و...

**بیمارستان عمومی**: نەخۆشخانەی گشتی؛ نەخۆشخانەی دەرمانکاری هەموو جۆرە نەخۆشیەک.

**بیمارستانی** / bîmārestānî/: *صفت*. نەخۆشخانەیی؛ خەستەخانەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە نەخۆشخانەوە ‹کار بیمارستانی: کاری نەخۆشخانەیی›.

**بیمارگونه** / bîmārgûne/: *صفت*. نەخۆشئاسا؛ وەکوو نەخۆش؛ نزارانە ‹رفتار بیمارگونه: ئاکاری نەخۆشئاسا›.

**بیماری** / bîmārî، ـهـا/: *اسم*. نەخۆشی؛ ناخۆشی؛ نەخۆشین؛ ناخۆشین؛ نەوەشی؛ دەغەز؛ نێوەشانی؛ نەساغی؛ نەساخی؛ ناساخی؛ ناساغی؛ ناساقی؛ ناسازی؛ بێماری؛ هللە؛ لەشبەباری؛ هەر چەشنە ناکۆکی یان ناتەباییەک لە لەشی زیندەوەردا.

▣ **بیماری ارتفاع**: ۱. *[روانشناسی]* بەرزە ترسی؛ نەخۆشی ترسان لە بەرزایی ۲. بێنەفەسی؛ نەخۆشی بەهۆی کەم بوونەوەی هەوا لە بەرزاییەوە: **هوازدگی * آزاربلندی**

**بیماری آمیزشی**: نەخۆشی تێکەڵی؛ هەر جۆرە نەخۆشییێک کە بە بۆنەی سەرجێیی کردنەوە تووشی مرۆ دەبێت (وەک سووزاک).

**بیماری بومی**: نەخۆشی ناوچەیی؛ نەخۆشی وا کە زیاتر خەڵکی ناوچەیەک تووشی دەبن.

**بیماری پارکینسن**: فلج تشنجی ☜ **فلج**

**بیماری جوع**: نەخۆشی برسیەتی؛ نەخۆشی زاف؛ نەخۆشی تێر نەخواردن کە بە بۆنەی تێکچوونی بەشێکی مێشکەوە تووش دەبێ: **مرض جوع**

بیماری خواب: نەخۆشی خەوبردوویی؛ نەخۆشی خەوخەوی کە بە بۆنەی پێوەدانی جۆرێ مێشەوە تووش دەبێ.
بیماری روانی: نەخۆشی ڕەوانی؛ هەر شێوە ئالۆزیەکی سەر بە ڕەوانی مرۆ.
بیماری سخت: بەلوەشێن؛ نەخۆشی گران؛ دەردی گران؛ نەخۆشینی سەخت.
بیماری شغلی: نەخۆشی پیشەیی؛ هەرکام لەو نەخۆشیانە کە زۆرتر کارکەرانی کارێکی تایبەت تووشی دەبن.
بیماری شکوفەی انگور: هەلەم؛ نەخۆشی هەرزنەی ترێ.
بیماری طوطی ☜ تب طوطی، **تب**
بیماری عفونی: نەخۆشی تەشەنە؛ نەخۆشی قەگرتن؛ نەخۆشیەک کە بە بۆنەی زۆرگرتن و زیادکردنی میکرۆب لە ناو لەشدا سەر هەڵدەدا.
بیماری قارچی: نەخۆشی کوارگی؛ نەخۆشی سەر تێکردنی کوارگی نەخۆشی‌هێنەر لە پاژێکی لەش بەتایبەت لە سەر پێست.
بیماری قند: نەخۆشی قەن؛ دیابێت.
بیماری مسری/ واگیردار: درۆم؛ درم؛ پەتا؛ ئازار؛ ئاهۆ؛ درووشە؛ ماختەتە؛ مافەتا؛ دەردی گیرۆ؛ وەگر؛ نەخۆشی گیرۆ؛ پەژێک؛ نەخۆشیێک کە لە کەسێکەوە کەسێکی‌تر تووش دەبێ.
بیماری همەگیر: نەخۆشی وەگیر؛ نەخۆشی ڤەگرتی؛ نەخۆشیێک کە لە ماوەیێکی کورتدا لە ناوچەیەک بڵاو دەبێتەوە و بەشێکی گەورە لە ئاپۆرە تووشی دەبن.
◘ از بیماری برخاستن: هەستانەوە؛ چاکبوونەوە؛ خاس‌بوونەوە و ئیتر لەبەر نەخۆشی نەخەوتن.

**بیماریابی** / bîmāryābî /: [ها/:/اسم. نەخۆش‌دۆزی؛ دۆزینەوە و سیایی گرتن لە نەخۆشانی ناوچەیەک بۆ دەرمانیان و بەرگری لە پەرەساندنی نەخۆشیەکە.
**بیماریزا** / bîmārîzā/: *صفت*. نەخۆشخەر؛ نەخۆشیهێن؛ نەخۆشکەر.
**بی‌مانند** / bîmānand/: *صفت*. بێ‌چوون؛ بێ‌وێنە؛ بێ‌گۆرەبا؛ نەهەم هەڤ؛ بێ‌هاوتا؛ تاقانە؛ یەکە.
**بی‌مایه** / bîmāye/: *صفت*. ١. بێ‌ئامێژەن؛ بێ‌ئامیان؛ بێ‌هێم ٢. *[مجازی]* بێ‌دەسمایە؛ بێ‌مایە ٣.*[مجازی]* بێ‌ئاگا؛ نائاگا ‹آدم بی‌مایه فقط ادعا دارد: مرۆی بی‌ئاگا هەر گفەیە›.
**بی‌مبالات** / bîmobālāt/: [فارسی/ عربی] *صفت*. گەللایی؛ گوێ‌نەدەر؛ ئەرزان؛ ناگۆش‌گیر؛ بێ‌مبالات ‹اینجا برای آدم بی‌مبالات جایی نیست: لێرە مرۆی گەللایی ڕێگای نیە›.
**بی‌مبالاتی** / bîmobālātî/: [فارسی/ عربی] *قید*. ڕووساردی؛ گوێ نەدەری؛ بێ‌مبالاتی ‹در این کار خیلی بی‌مبالاتی کرد: لەم کارەدا زۆری ڕووساردی کرد›.
**بی‌مثال** / bîmesāl/: [فارسی/ عربی] *صفت*. بێ‌وێنە؛ بێ‌هاوتا؛ بێ‌گۆرەبا؛ بێ‌چەشن ‹خوشا بهاران بی‌مثال کردستان: چەند خۆشە بەهارانی بێ‌وێنەی کوردستان›.
**بی‌محابا**[1] / bîmahābā, bîmohābā/: [فارسی/ عربی] *صفت*. بێ‌ترس؛ بێ‌نیگەرانی ‹رفتار بی‌محابا: جوولانەوەی بێ‌ترس›.
**بی‌محابا**[2]: *قید*. بێ‌ترس؛ بێ‌نیگەرانی ‹بی‌محابا پیش رفت تا به سنگرهای دشمن رسید: بە بێ‌ترس چووە پێشەوە تا گەیشتە مەتەرێزەکانی دوژمن›.
**بی‌محل** / bîmahal/: [فارسی/ عربی] *صفت*. ١. ناوەخت؛ نابەجێ؛ ناڕەوا ‹خروس بی‌محل:

کەلەشێری ناوەخت› ٢. بێ‌پشتیوان؛ بێ پاڵپشت ‹چک بی‌محل: چەکی بێ‌پشتیوان›.

**بی‌مخ** / bîmox/: [فارسی/ عربی] *صفت*. *[گفتاری]* بێ‌مێشک؛ بێ‌مەژگ؛ بێ‌مەژی؛ کەللەشەق؛ سەرەخەر؛ خرپوو؛ قرۆڵ.

**بی‌مزه** / bîmaz(z)e/: *صفت*. بێ‌تام؛ ناخۆش: ١. بێ‌چێژە ‹غذای بی‌مزه: چێشتی بێ‌تام› ٢. *[کنایی]* نەشیاو؛ نالەبار (سەبارەت بە ئاکار و کردار) ‹شوخی بی‌مزه: شۆخی ناخۆش›.

**بی‌مصرف** / bîmasraf/: [فارسی/ عربی] *صفت*. ١. ـها/ بێ‌کەڵک؛ گەندەڵ؛ چرووک؛ کارلێ‌نەهاتوو ‹آدم بی‌مصرف: مرۆی بێ‌کەڵک› ٢. داکەوتوو؛ بەبێ کەڵک لێ‌گرتن ‹پولش همینطور بی‌مصرف افتاده: پارەکەی هەروا داکەوتووە›.

**بی‌معرفت** / bîma'refat، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت*. ئەمەگ‌نەناس؛ بە هەڵس‌وکەوتی دوور لە بایەخگەلی کۆمەڵگا ‹برادرت خیلی بی‌معرفت است، یک تلفن به ما نمی‌زند: براکەت زۆر ئەمەگ‌نەناسە، تەلەفوونێکمان بۆ ناکا›.

هەروەها: **بی‌معرفتی**

**بی معطلی** / bîmo'attalî/: [فارسی/ عربی] *قید*. دەسبەجێ؛ جێ‌وەجێ؛ خێرا؛ ئازا؛ ڕێوڕا ‹بی‌معطلی پول را داد: دەسبەجێ پارەکەی دا›.

**بی‌معنی** / bîma'nî/: [فارسی/ عربی] *صفت*. ١. بێ‌واتا؛ بێ‌ناوەرۆک؛ بێ‌مانا ‹این جمله بی‌معنی است: ئەم ڕستە بێ‌واتایە› ٢. پڕوپووچ؛ هیچ و پووچ؛ گەزاف؛ حەلەق‌مەلەق ‹چرا حرفهای بی‌معنی می‌زنی: بۆچی قسەی پڕ و پووچ ئەکەی›.

**بی‌مغز** / bîmaqz/: *صفت*. ١. *[کنایی]* بێ‌مێشک؛ سەربەتاڵ؛ نەزان؛ بێ‌ئاوەز؛ بێ‌یۆڵ؛ بێ‌مەژگ ‹خیال نمی‌کردم این اندازه سادەلوح و بی‌مغز باشد: نەمدەزانی ئەوەندە ساویلکە و بێ‌مێشک بێ› ٢. پووچەڵ؛ پووچ؛ بێ‌ناو؛ بێ‌ناوک؛ قرۆڵ ‹گردوی بی‌مغز: گوێزی پووچەڵ›.

**بی مقدار** / bîmeqdār/: [فارسی/ عربی] *صفت*. تەوش؛ بێ‌بەها؛ بێ‌قیمەت؛ مەراش؛ بێ‌ئەرزش؛ بێ‌بایەخ؛ بێ‌نرخ؛ بێسە.

**بی‌مقدمه**[1] / bîmoqaddame/: [فارسی/ عربی] *صفت*. ناکاو؛ یەک‌جارەکی؛ کوتوپڕ؛ یەکهەو؛ گز و گومەت؛ گز و گومبەت؛ گز و گوم؛ لەپڕ و نەکاو؛ ناگا؛ بە بێ‌شۆنەوار یان نیشانەیەک لە ڕابردووەوە ‹دردش بی‌مقدمه بود: ئێشەکەی لە ناکاو بوو›.

**بی‌مقدمه**[2]: *قید*. لەناکاو؛ لەپڕ و نەکاو؛ بە یەک‌جارەکی؛ کوتوپڕ؛ یەکهەو؛ ناگا؛ گز و گومەت؛ گز و گومبەت؛ گز و گوم ‹بی‌مقدمه نمی‌شود او را بیرون کرد: لە نەکاو نابێ دەربکرێ›.

**بی‌ملاحظه**[1] / bîmolāheze/: [فارسی/ عربی] *صفت*. ١. بێ‌پەروا؛ بێ‌ترس؛ بێ‌باک ‹رفتار بی‌ملاحظه: ئاکاری بێ‌پەروا› ٢. بێ‌ڕووبینی ‹آدم بی‌ملاحظه: بنیادەمی بێ‌ڕووبینی›.

**بی‌ملاحظه**[2]: *قید*. بێ‌ڕووبینی؛ بەبێ ڕەچاو کردنی بنەما و ڕێوشوێنی پەسندکراو ‹بی‌ملاحظه همەی حرفهایش را زد: بێ‌ڕووبینی هەموو قسەکانی کرد›.

**بی‌مناسبت** / bîmonāsebat/: [فارسی/ عربی] *صفت*. نابەجێ؛ بێ‌جێ؛ بێ‌یاگێ؛ بێ‌بۆنە ‹اگر اینجا یادی از او شود، بی‌مناسبت نخواهد بود: ئەگەر لێرەدا یادێکی لێ بکرێ، بێ‌جێ نیە›.

**بیمناک** / bîmnāk/: *صفت*. *[ادبی]* ١. نیگەران؛ دڵ‌پەرێشان؛ پەرۆش ‹زن از آیندەی خود بیمناک بود: ژنەکە لە داهاتووی نیگەران بوو› ٢. سامناک؛ بسەهەم؛ بەسام ‹راه بیمناک است: ڕێگە سامناکە›.

**بی‌مو** / bîmû/: *صفت*. زەلووت؛ بێ‌موو؛

بێ‌تووک.

**بـــی‌موقـــع** / bîmo:qe', -mowqe' /: [فارســی/ عربـی] قید. ١. بــێ‌وه‌خــت؛ نــاوه‌خــت؛ بێگــاف ‹شب بی‌موقع زنگ زد: شه‌و ناوه‌خت زه‌نگی لێدا› ٢. نابه‌جێ؛ بێ‌یاگێ؛ له شوێن یا بۆنه‌یه‌کی نابه‌جێ ‹خیلی بی‌موقع گفت: زۆر نابه‌جێ گوتی›.

**بیمه** / bîme، ـها/: [هندی] /اسم. دابین؛ بیمه؛ بڕیارنامه‌یه‌ک که له سۆنگه‌یدا، لایێک له پێناو وه‌رگرتنی مزێکی دیاریکراوه‌وه به لایه‌کی‌تر گفت ده‌دا که ئه‌گه‌ر به هۆی کاره‌ساتێکه‌وه زیانێکی لێ‌که‌وت بۆی قه‌ره‌بوو بکاته‌وه.

▣ **بیمه‌ی آتش‌سوزی**: دابینی ئاور تێبه‌ربوون.

**بیمه‌ی اتومبیل**: دابینی ترۆمبیل؛ بیمه‌ی ماشین.

**بیمه‌ی اجتماعی**: دابینی کۆمه‌لایه‌تی؛ جۆرێک دابینی تایبه‌ت به تاقمێکی دیاریکراو له کۆمه‌ڵ.

**بیمه‌ی ازکارافتادگی**: دابینی له‌کار که‌وتوویی؛ بیمه‌ی کاتی پیری یان له‌کارکه‌وتوویی به بۆنه‌ی ڕووداوێکه‌وه.

**بیمه‌ی باربری**: دابینی باربه‌ری؛ دابینی قه‌ره‌بووکردنه‌وه‌ی بار، ئه‌گه‌ر بفه‌وتێ.

**بیمه‌ی بیماری و درمان**: دابینی ده‌وا و ده‌رمان.

**بیمه‌ی حوادث**: دابینی کاره‌سات؛ دابینی بژاردنی زه‌ره‌ری هه‌موو جۆره کاره‌ساتێک.

**بیمه‌ی دزدی**: دابینی دزی؛ دابینی ماڵی دزراو تا ڕاده‌ی دیاریکراو.

**بیمه‌ی ساختمان**: دابینی خانووبه‌ره؛ دابینی ماڵ ئه‌گه‌ر تووشی زیانێک بێ.

**بیمه‌ی سرنشین**: دابینی مسافر؛ بیمه‌ی دانیشتوانی ناو ماشێن.

**بیمه‌ی شخص ثالث**: دابینی سێهه‌م که‌س؛ بیمه‌ی بژاردنی خه‌سارێک که له لایه‌ن دابین‌دانه‌ره‌وه به که‌سێکی‌تر بگا.

**بیمه‌ی عمر**: دابینی ژیان؛ بیمه‌ی پاره‌دان به که‌س‌وکاری دابین‌دانه‌ر، ئه‌گه‌ر بمرێ.

**بیمه‌ی کارگری**: دابینی کرێکاری.

هه‌روه‌ها: **بیمه‌ی کارمندی**

▣ **بیمه شدن**: بیمه بوون؛ دابین بوون.

هه‌روه‌ها: **بیمه بودن؛ بیمه شدن؛ بیمه کردن**

**بی‌مهر** / bîmehr /: صفت. بێ‌مێر؛ بێ‌مێهر؛ بێ‌خۆشه‌ویستی؛ نامیره‌وان. به‌رانبه‌ر: **مهربان** ‹من ندانستم از اول که تو بی‌مهر و وفایی: ئه‌ز نزانام ژبه‌رێدا کته بی‌میر و وه‌فای›.

**بی‌مهری** / bîmehrî، ـها/: /اسم. بێ‌مێری؛ بێ‌مێهری؛ ناوه‌شه‌ویسی؛ بێ‌خۆشه‌ویستی: ١. بار و دۆخ و چۆنیه‌تی نه‌بوونی خۆشه‌ویستی بۆ که‌سێک ‹این نشانه‌ی بی‌مهری توست: ئه‌مه نیشانه‌ی بێ‌مێری تویه› ٢. کار یان ڕه‌وتی پیشاندانی ئاکاری بێ‌مێهره‌وانی ‹اشک من رنگ شفق یافت ز بی‌مهری یار: بوو به خوێن فرمێسکی چاوم هێنده یار بێ‌مێهری کرد›.

**بیمه‌گر** / bîmegar، ـها؛ ـان/: [هندی/ فارسی] /اسم. دابینکار؛ بیمه‌کار؛ بیمه‌ده‌ر؛ که‌س یان دامه‌زراوه‌یه‌ک که بیمه ده‌کاته‌وه .

**بیمه‌گزار** / bîmegozār، ـها؛ ـان/: [هندی/ فارسی] /اسم. دابینیار؛ که‌سێ که گیان یان ماڵی له لای بیمه‌کاره‌وه بیمه ده‌کا.

**بیمه‌نامه** / bîmenāme، ـها/: [هندی/ فارسی] /اسم. دابین‌نامه؛ بیمه‌نامه؛ نووسراوه‌ی نێوان دابینکار و دابین‌دانه‌ر.

**بی‌میلی** / bîmaylî، ـها/: [فارسی/ عربی] /اسم. بێ‌وازی؛ بێ‌مه‌یلی؛ ساردی ‹نسبت به

پێشنهادم بی‌میلی نشان داد: لە بەرامبەر پێشنیارەکەمەوە بێ‌وازی کرد›.

**بی‌میوه** / bîmîve/: *صفت.* بێ‌بەر؛ بێ‌میوە؛ بێ‌وەر: ۱. بێ‌وەچ؛ داری بێ‌بەر ‹سپیدار از درختان بی‌میوه است: سپیدار لە دارگەلی بێ‌بەرە› ۲. *[کنایی]* مرۆڤ (بەتایبەت) پیاوی بێ‌منداڵ.

**بین** / bayyen/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* ئاشکرا؛ پەیدا؛ خویا؛ ڕۆشن؛ بەرچاو؛ دیار؛ ڕوون ‹فرق بین: جیاوازی ئاشکرا›.

**بین** / bayne/: [عربی] *حرف.* نێوان؛ ناوەین؛ بەین؛ ژەڤەک ‹بین آنها دعوا شد: لە نێوانیاندا بوو بە شەڕ›.

**ـ بین** / bîn/: *پیوازه.* ـ بین؛ ـوین: ۱. بینەر؛ وینەر ‹تاریک بین: ڕەش‌بین› ۲. ـ ئرمان؛ ئرمانەر؛ نیشاندەر؛ پیشاندەر ‹دوربین: دووربین›.

**بینا** / bînā، ـها؛ ـیان/: *صفت.* بینا: ۱. چەشدار؛ دیتۆخ؛ خاوەن هێزی دیتن ‹چشم بینا: چاوی بینا› ۲. *[مجازی]* ژیرڤان؛ ڕوون‌بین؛ خاوەن توانایی پێش‌بینی و هەڵسەنگاندنی ڕێک و ڕاستی ڕووداوگەل ‹چشم دل بینا کن: چاوی دڵ بیناکەوە›.

**بینائی** / binā'i/ ☜ **بینایی**

**بیناب** / bînāb، ـها/: *اسم.* شەبەنگ؛ ڕەشەک؛ شەوەنگ؛ تەیف؛ نەوارێکی پێکهاتوو لە پرشنگ یان مەوجی لە پەنا یەک.

**بینات** / bayyenāt/: [عربی] جمعِ ☜ **بَیِّنه**

**بین‌الطلوعین** / baynottulû'ayn/: [عربی] *اسم.* تاریک و ڕوون؛ بوولێڵە؛ تاریک و لێڵ؛ گورگ و مێش؛ بوومەلێڵ؛ ڕووناکی نێوان ئاخر و ئۆخری شەو تا هەڵاتنی تاو یان سەر ئێوارە تا سەری شەو.

**بین‌المجالس** / baynolmacāles/: [عربی] *صفت.* نێو ئەنجومەنی؛ سەر بە پارلەمانی نێونەتەوەگەل.

**بین‌الملل** / baynolmelal/: [عربی] ☜ **بین‌المللی**

**بین‌المللی** / baynolmelalî/: [عربی] *صفت.* نێونەتەوەیی؛ ناڤنەتەوەیی؛ ناڤنەژادی؛ سەر بە گەلانی دنیا: **بین‌الملل**

**بین‌النهرین** / baynonnahrayn/: [عربی] *اسم.* ناوچۆمان؛ نێوچۆمان؛ ناوڕووان؛ میزۆپۆتامیا؛ هاوران؛ زەوینی نێوان دوو ڕووباری دەجلە و فورات.

**بین‌الهلالین** / baynolhelālayn/: [عربی] *قید.* نێوکەوانە؛ نێو دووکەوان؛ ناو پەڕانتێز.

**بینایی** / bînāyî، ـها/: *اسم.* بینایی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی بینا بوون ‹نه بینایی افزون ز دانایی است: کوا بینایی لە زانایی سەرترە› ۲. سۆما؛ سۆ؛ بیناهی؛ هانا؛ هەتەر؛ گوردی دیتن ‹خرد بهتر از چشم بینایی است: ئاوەز بینایەکی باشتر لە چاوە› ۳. وینایی؛ هەتەر؛ سۆما؛ سۆ؛ هانا؛ هەستێ کە لە ڕێگەی چاوەوە دەور و بەر دەناسێ ‹بر اثر پیری، به تدریج بینایی کم می‌شود: لەبەر پیری، بەرە‌بەرە بینایی کەم دەبێتەوە› ٤. *[قدیمی]* چاو؛ چەو؛ چەم؛ چەهڤ؛ دیدە ✻ **بینائی**

**بینایی‌سنجی** / bînāyîsancî، ـها/: *اسم.* بینایی‌پێوی؛ کاری تاقی‌کردنەوەی ڕادەی سۆمای چاو.

**بین‌راهی** / baynerāhî/: *صفت.* ناوڕێ؛ نێوڕێ؛ دڵێ‌ڕای؛ پێوەندیدار یان سەر بە شوێنێک لە نێوان ڕێگایێکدا ‹مسافر بین‌راهی: مسافری ناوڕێ›.

**بینش** / bîneš، ـها/: *اسم.* ڕوانگە؛ بینشت: ۱. توانایی ڕوانین و وردبوونەوە لە دیاردەگەل و ڕووداوەکان و بەرئەنجام گرتن لێیان ۲. چۆناوچۆنی ئەو توانایییە ‹بینش توحیدی: ڕوانگەی یەکتاپەرستی›.

**بـــی‌نـــشان** / bînešān/: *صفت.* بــێ‌نیــشان؛ بێ‌شوێن؛ بــێ‌شـوێن و بـەر؛ بــێ سـەر و شـوێن؛ وەتانەت. هەروەها: **بی‌نشانی**

**بـــی‌نظمـــی** / bînazmî، ـهـا/: [فارســی/ عربــی] *اسم.* شـپرزی؛ تێکـەڵ‌پێکـەڵـی؛ ناتـەکـووزی ‹بـی‌نظمـی موجـب اخـراج شـما از مدرسـه مـی‌شـود: شپرزی ئەبێتـە هـۆی دەرکردنتـان لـە قوتابخانـە›.

هەروەها: **بی‌نظم**

**بی نظیر** / bînazîr/: *صفت.* بــێ‌وێنـە؛ بــێ‌هاوتـا؛ بێ‌گۆرەبا؛ بـێ‌هـەواڵ؛ تـلّ؛ تـاک؛ تـاق؛ کـەلـە؛ کـەموێنـە؛ بـێ‌چـوون ‹فرصـت بـی‌نظیـر: هـەلی بێ‌وینە›.

**بینگو** / bîngo/: [انگلیسی] ☜ **لوتو**

**بـــی‌نمـــک** / bînamak/: *صفت.* بــێ‌مــەک: ١. بــێ‌خـوێ؛ کـەلی؛ کـەلـێ ‹غـذای بـی‌نمـک: چێـشتی بــێ‌مــەک› ٢. *[مجــازی]* بـــێ‌تـام؛ نـاخۆش؛ ناشـیرین ‹شـوخی بـی‌نمـک: شـۆخی بێ‌مەک›.

**بیننـــده** / bînande، ـهـا؛ ـگـان/: *اسم.* بینــەر؛ وینــەر؛ چاولێکـــەر؛ نهێرتـــۆخ؛ تماشـــاکەر؛ تواشـــاکەر؛ تــەماشــەڤــان ‹بیننـدەی تلویزیـون: بینەری تەلەفیزیون›.

**بینوا** / bînavā، ـها؛ ـیان/: *صفت.* ١. بـەلـەنگـاز؛ بلـەنگـاز؛ ڕەواڵ؛ هــەژار؛ ژار؛ نــەدار؛ لانــەواز؛ بــرەش؛ کاسـۆ؛ فـەقـیر؛ بـەسـتەزمـان؛ گێتـە؛ ڕووق؛ نــەتێــر؛ برچـــی؛ واردەس؛ دەســکورت؛ خــزان؛ بــێ‌حــاڵ؛ بــێ‌مـاڵ؛ ڕەبــەن؛ سـەڵـت؛ بێ‌دەر؛ بێ‌تووتە؛ بێ‌ئـەنـوا؛ بــێ‌نــەوا؛ لامیسک؛ نـــاک؛ لیتـــەک؛ بابـــەدەســـت؛ ڕووت؛ زوار؛ ڕەجەن؛ ڕەجاڵ؛ بـەژمالـە؛ نـسک؛ دەسـتەنـگ؛ سـوخت؛ مـانتێر؛ هــەناســە سـارد ‹از بینوایـان دستگیری مـی‌کـردم: دەسـتی هـەژارانـم دەگـرت› ٢. بێچـارە؛ چـارەڕەش؛ ڕۆژڕەش؛ بـەدبـەخـت؛ پەژۆم.

**بینوائی** / bînavā'î/ ☜ **بینوایی**

**بینـوایی** / bînavāyî، ـهـا/: *اسم.* بـەلـەنگـازی: ١. نەبـوونی؛ هـەژاری؛ نـەداری ٢. بیچـارەیـی؛ بەدبەختی؛ پەژۆمی ❋ **بینوائی**

**بـــی‌نوبـــت** / bîno:bat, -nowbat/: [فارســی/ عربــی] *قیـد.* بــێ‌ســەرە؛ بــێ‌نــۆرە؛ بــێ‌نۆگــە؛ بێ‌نۆبەت ‹آقا! چرا بی‌نوبـت سـوار مـی‌شـوید: کاکـە! بۆچی بی‌نورە سوار ئەبی؟›.

**بینــه** / bayyene، بیّنـات/: [عربـی] *اسم. [حقـوق]* بەڵـگەی ڕوون؛ گـەواهێـک کـە هـەبـوونی بـۆ چەسپاندنی سکالایەک پێویستە.

**بینه** / bîne/: *اسم.* حـەمـام سـەرد؛ جـل‌کـەن؛ حـەمامـەچیـا؛ جـێ جلکـان لـە حـەمـامی گشتیدا: **سرِ بینه**

**بـــی‌نهایـــت**[1] / bînahāyat/: [فارســی/ عربــی] *اسم.* بێ‌برانەوە؛ بێ‌گامـە ‹تـا بـی‌نهایـت ادامـه دارد: تا بێ‌برانەوە درێژەی هەیە›.

**بـــی‌نهایـــت**[2]: *صفت.* بــێ‌دوایــی: ١. بێتـا؛ تـا سـەر؛ تـا هـەتـا؛ بــێ‌برانـەوە؛ بـێ‌بـن؛ لـە دوا نـەهـاتوو ‹راه بـی‌نهایـت: ڕێگـەی بـێ‌برانـەوە› ٢. زۆر؛ لەڕادەبـــەدەر؛ هـــەرمـــاو ‹رنـج بی‌نهایت: ڕەنجی بێ‌دوایی›.

**بینـی**[1] / bînî، ـهـا/: *اسم.* لـووت؛ لووتـە؛ لیـت؛ پـــت؛ پـــەت؛ دەمـــاخ؛ دم؛ فرنـــک؛ تفنـــک؛ خرنـاق؛ کـەپ؛ کـەپـۆ؛ کـەپـوو؛ کـەپووگـە؛ کـەپـی؛ کـەپۆلـک؛ کـاپۆ؛ کـەپـۆڵ؛ کـاپۆڵ؛ کەپووی؛ کاپۆلک؛ بێقل؛ بـەقـل؛ دفـن؛ دەفـن؛ پۆز؛ تونک؛ زنژ؛ نوفت؛ ئـەنـدامی بـۆن بیـستن کە لە ناوەڕاستی دەم و چاو دایە.

**بینی پهن** / bînîpahn/: *صفت.* مـۆژ؛ کـەپۆپـان؛ کەپـی‌پـان؛ بێـقل فـەتـسی؛ لـووت دانـسیاگ؛ لووت‌پان.

**ـ بینی**[2]: *پیواژه.* ـ بـینی؛ ـ ویـنی؛ ـ وێـنی؛ کـار یان ڕەوتی دیتن ‹دوربینی: دووربینی›.

**بـــی‌نیـــاز** / bîniyāz/: *صفت.* بـێ‌نیـاز؛ کـار بـە کەس‌نا؛ چاڤ‌تێر؛ بوودە.

**بـــی‌نیـــازی** / bîniyāzî/: اسم. بـــێ‌نیـــازی؛ دوورنیـــازی؛ ســـەربـــەخـــۆیی؛ کاربەکـــەس نـــەیـــی ‹تندرستی موجـب بـی‌نیـازی بـه دارو مـی‌شـود: تـەندروسـتی هـۆی بـێ‌نیـازی لـە دەوا و دەرمانە›.

**بینـــی‌واره** / bînîvāre، ـهـا/: اسم. لووتـەوانـە؛ لووت‌وانە؛ جـۆرە خشـڵێک لـە لـووتی دەکـەن، پێـشتر زۆر بـاو بـووە، ئێـستاش لـە باشـووری ئێران و هەروەها لە هیندووستان هەیە.

**بـــی‌واســـطه**[1] / bîvāsete/: [فارسـی/ عربـی] صفت. ڕاستەوخـۆ؛ بـێ‌پێنـاو ‹فـروش بی‌واسطه: فرۆشی ڕاستەوخۆ›.

**بـــی‌واســطه**[2]: قید. ڕاســتەوخــۆ؛ بـێ‌پێنــاو ‹بـی‌واسطه بـا خـودش حـرف بـزن: ڕاسـتەوخـۆ لەگەڵ خۆیدا قسە بکە›.

**بیوت** / buyût, boyot/: [عربی] جمعِ ☜ **بِیت**

**بیوتـــات** / buyûtāt, boyotāt/: [عربـی] اسم. خانووبەرەی سەر بە دامەزراوەیەک.

**بـــی‌وجـــود** / bîvocûd/: [فارسی/ عربی] صفت. بێ‌بایـەخ؛ بـێ‌ئـەرزشـت؛ داکـەوتـوو؛ بـێ‌قابـل؛ سووک و چرووک.

**بی‌وزنـــی** / bîvaznî، ـهـا/: [فارسی/ عربی] اسم. بـێ‌سـەنگـی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی نـەبـوونی کـێش بـە هـۆی نـەبـوونی هێـزی داکـشاندنی زەویەوە.

**بیوســـفر** / biyosfer/: [فرانـسوی] اسم. ئـەو بـەشـەی لـە زەویـن و هـەوای پـەگالـی کـە جێگـای ژیـانی گیاندارانـە، یـان بـۆ ژیـان دەشێ.

**بیوســـــیدن** / biyûsîdan/: مـصدر. متعـدی. [نامتـداول] چـاوەڕێ بـوون؛ چـاوەنـواڕ بـوون؛ چاوەڕوان بـوون؛ چـاوەنـۆڕ بـوون؛ چـەمـەڕا بیـەی؛ بـە دیـارەوە نیـشتەی؛ چـاو بـەڕێـی شتێک یان ڕووداوێک بوون.

**بیوشـــــیمی** / biyošîmî/: [فرانـسوی] اسم. لقێک لە زانستی کیمیـا کـە دەپـەرژێتـە سـەر پێکهاتـــە و ڕەوتگـــەلی کیمیـــاوی نێـــوان ژینەوەران.

**بـــی‌وفـــا** / bîvafā/: [فارسـی/ عربـی] صفت. بێ‌ئەمەگ؛ بێ‌وەن؛ بێ‌بەینەت.

**بیوفیزیـــک** / biyofîzîk/: [فرانـسوی] اسم. لقێـک لـە زانـستی فیزیـک کـە دەپـەرژێتـە سـەر وەگـەڕ خـستنی بنـەمـا و شـێوازگەلی فیزیک لە بابەتگەلی سەر بە زیندەوەرانەوە.

**بـــی‌وقـــار** / bîvaqār/: [فارسـی/ عربـی] صفت. سووک؛ بێ‌قەدر.

**بـــی‌وقـــت**[1] / bîvaqt/: [فارسـی/ عربـی] صفت. ناوەخت؛ بـێ‌وەخـت؛ دێـر ‹حـالا بی‌وقت است: ئێستە ناوەختە›.

**بـــی‌وقـــت**[2]: قید. بـێ‌گـاف؛ نـاوەخـت: ١. بێ‌وەخت؛ لە کـاتی نـاوەختـدا ‹بی‌وقت رفتیم: بـێ‌گـاف ڕۆیـشتین› ٢. دوای کـاتێکی لـە بەرچاو و دیـاریکراو؛ دێـروەخـت ‹بی‌وقت شام دادند: بێ‌گاف شێویان دانا›.

**بیـــوگرافی** / biyog(e)rāfî، ـهـا/: [فرانـسوی] اسم. ژیـن‌نامـە؛ بـە سـەرهات ‹بیوگرافی مستوره شـاعر نامـدار کردزبـان را خوانـدم: بـە سەرهاتـی مـەسـتووره شـاعیری گـەورەی کوردزمـانم خوێندەوە›.

**بیـــولۆژی** / biyolojî/: [فرانـــسوی] اسم. ژینـەوەرناسـی؛ زینـدەوەرناسـی؛ ژیـن‌ناسـی؛ ژیوارناسـی؛ زیوارناسـی؛ زانـستی کـڕوکاش و کۆڵینەوەی هەموو بابەتگەلی ژیان.

**بیولۆژیـست** / biyolojîst، ـهـا/: [فرانسوی] اسم. ژینـەوەرنـاس؛ زینـدەوەرزان؛ ژیـن‌نـاس؛ ژیوارناس؛ زیوارناس.

**بیولۆژیک** / biyolojîk/: [فرانسوی] ☜ **بیولۆژیکی**

**بیـــولۆژیکی** / biyolojîkî/: [فرانـسوی] اسم. ژینـەوەری؛ زینـدەوەری؛ زانـستی سـەبـارەت بـە ژیـان و ناسـینەوەی تایبەتمەندیـەکانی:

**بیولۆژیک**

**بیونیک / biyonîk/**: [فرانسوی]/ _اسم_. زانستی چاوبڕین و کەڵک‌گرتن لە چۆناوچۆنی کار کردنی ئەندامگەلی زینەوەران بۆ ڕوون کردنەوە و بەرەو پێش بردنی بابەتگەلی ئەندازیاری.

**بیوە / bîve**، ـها؛ ـگان/: _صفت_. بێوە؛ ئێوە؛ بیڤە؛ بێ‌ژن(بۆ پیاو)؛ بێ‌شوو(بۆ ژن)؛ بەبێ لف بە هۆی مردن یان جیاوە بوون لە هاوسەرەوە ‹زن بیوه: مرد بیوه: ژنی بیوە؛ پیاوی بێ‌ژن›.

**بیوەزن / bîvezan**، ـها؛ ـان/: _اسم_. بێوەژن؛ ژن‌بێ؛ ژنەبێ؛ بێ؛ ژنێ کە شووەکەی مردووە یان لێ‌جیا بووەتەوە.

**بی‌همتا / bîhamtā/**: _صفت_. بێ‌هاوتا؛ بێ‌هامتا؛ بێ‌هەمباز؛ کەتۆ؛ تاقانە؛ فەرد؛ بێ‌وێنە.

**بی‌همه‌چیز / bîhamečîz/**: _صفت_. _[گفتاری]_ خوێڕی؛ بەرەڵڵا؛ سەڵیت؛ بێ‌بەش لە خۆ و خدەی مرۆڤانە (وەک: شەرەف، ڕاستی، وەفا و...).

**بی‌هنر / bîhonar/**: _صفت_. زۆڵک؛ خوێڕی؛ بێکارە؛ بێ‌هونەر؛ بێ‌جەوهەر.

**بی‌هنگام / bîhengām, bîhangām/**: _قید_. _[ادبی]_ بێ‌گاف؛ بێ‌هەنگام؛ ناوەخت: ١. پێش یان پاشی کاتی شیاو و دیاریکراو ٢. نابەجێ؛ بێ‌وەخت.

**بی‌هوا / bîhavā/**: [فارسی/ عربی] _قید_. هەرەمە؛ هاکۆ: ١. هەروا؛ بەخۆوە؛ بێ بوونی مەبەستی پێشوو ‹بی‌هوا انداختم، خورد به شیشه: هەروا خستم، دای لە شیشەکە› ٢. سەربەردایی؛ بێ سەرنجدان بە کەسێ یان شتێک ‹بی‌هوا رانندگی می‌کرد: هاکۆ لێ‌دەخوڕی›.

**بی‌هوازی / bîhavāzî**، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی/ فارسی] _صفت_. _[زیست‌شناسی]_ بێ‌هەواژی؛ خاوەن توانایی ژین لە شوێنی بێ‌ئۆکسیژندا.

**بیهودگی / bîhûdegî**، ـها/: _اسم_. بێهۆیی؛ بێهوودەیی؛ بێخۆیی؛ بێ‌کەڵکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بێهۆ بوون ‹روزها به بیهودگی گذشت: ڕۆژگەل به بیهوی تێپەڕین›.

**بیهوده / bîhûde/**: _صفت_. بێهۆ؛ بێهوودە؛ بێخۆ؛ خۆڕایی؛ فیڕۆ؛ بێ‌فایدە؛ خت؛ خوت؛ بەخۆڕایی؛ خوت و خۆڕایی؛ خۆڕا؛ حاش؛ بێ‌بەهرە؛ بێداوی؛ بێ‌کەڵک؛ هەوانتە؛ بە بێ‌ئەنجام، بەرهەم یان کاردانەوەیەکی دڵخواز. هەروەها: **بیهوده بودن؛ بیهوده شدن**

**بیهوش / bîhûš/**: _صفت_. بێهۆش: ١. کونگ؛ تووشی بێهۆشی؛ لەسەرخۆ چوو ‹از خستگی بیهوش شد: لە شەکەتیدا بیهوش بوو› ٢. گێج؛ بلج؛ وڕ؛ کەم بیر و هۆش؛ بە بەهرەی هۆشی زۆر کەمەوە ‹تو آدم بیهوشی نیستی: خۆ تۆ گێج نیت›.

▣ **بیهوش شدن**: بوورانەوە؛ بوورینەوە؛ بووردنەوە؛ دڵڕووین؛ لە سەرخۆ چوون؛ سەرخۆ چوون؛ بێتار بوون؛ بێهۆش بوون؛ بێهۆش‌کەوتن؛ لەپڕین؛ ویەردەیوە؛ چ وێ شیەی؛ هۆشیاری خۆ لەدەس‌دان. هەروەها: **بیهوش بودن؛ بیهوش کردن**

**بیهوشدارو / bîhûšdārû**، ـها/: _اسم_. دەوای بێ‌هۆشی؛ دەرمانی بێهۆش‌کردن.

**بیهوشی / bîhûšî**، ـها/: _اسم_. بێهۆشی؛ کونگی: ١. بێهۆشی؛ دڵبووراوی؛ لە سەر خۆ چوویی ‹گاه دچار بیهوشی می‌شد: جارـ جار تووشی بێهۆشی دەبوو› ٢. کاری بێهۆش کردنی گیانلەبەر بە دەرمان ‹داروی بیهوشی: دەرمانی بیهوشی›.

**بی‌ینال / biyenāl/**: [فرانسوی] ☜ **دوسالانه**[1]

# پ

**پ** / p/: *حرف.* سێهەم پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.
**پ** / pe/: *اسم.* پێ؛ ناوی پیتی سێهەمی ئەلفوبێ زمانی فارسی.
**پ ـ** / p/: *پیشوند.* پـ ـ ؛ مـ ـ ؛ سەر نیشانەی وشەی لێڵ و بێواتا ‹چرت و پرت؛ چرند و پرند: هەڵیت و پەڵیت؛ حەلەق‌مەلەق›.
**پا**[1] / pā/: *اسم.* پا؛ پێ: ١. /ـها/ قاچ؛ کاچ؛ قول؛ لاق؛ باق؛ پاق؛ لۆق؛ لیق؛ لێق؛ چێق؛ لنگ؛ لینگ؛ لنگە؛ نگ؛ ننگ؛ لە ئەندامانی جووڵانەوەی گیانلەبەران کە لە مرۆدا بریەتیە لە ڕان، ئەژنۆ، پووز، قولەپێ و قامکان ‹پای راست؛ پای ملخ: پای ڕاست؛ پای کولە› ٢. بەشی ژێرووی پێ، لە قولەپێوە تا خوار ٣. یەکەی پێوان ☜ **فوت ـ ٢** ٤. *[مجازی]* هێز و وزەی بزوان ‹پای رفتن: پای چوون› ٥. *[مجازی]* هاوکایە؛ هاوبەش؛ ئامبازی؛ بەرانبەر ‹پای دعوا: پای شەڕ› ٦. *[مجازی]* ئەستۆ؛ مل؛ گەردن؛ گەردەن ‹این را به پای تو می‌نویسند: ئەمە دێتە پای تۆ›.
⊡ **پا به پای هم:** شان بە شانی یەک؛ پێ بە پێی یەک؛ هەنگاو بە هەنگاوی یەک؛ پا بە پاو یۆی ‹پا به پای هم رفتیم: شان بە شانی یەک چووین›.
**پای بازی:** هاوکایە؛ حەریفی کایە؛ پای کایە؛ پای گەمە.
**پای ملخ** ☜ ران ملخ، **ران**
⊡ **پا به پا بردن:** پێ بە پێ بردن؛ یارمەتی دان بۆ وەستاندن و بەرێوەبردنی کەسێک ‹دستم بگرفت و پا به پا برد: دەسی گرتم و پێ بە پێ بردمی›.
**پا به پا شدن:** ئەم پا ئەو پا کردن؛ ئی پا و ئەو پا کەردەی؛ ماتڵ‌کردن.
**پا به پای کسی رفتن:** شان بە شانی کەسێک ڕۆیشتن؛ پا بە پای کەسێ ڕۆیشتن؛ پا بە پاو یۆی لوەی؛ لوولی کەسێ چین.
**پا به سن گذاشتن:** *[مجازی]* کامڵ بوون؛ دەورانی لاوەتی تێپەڕکردن.
**پا پس کشیدن:** *[کنایی]* تەک دانە دواوە؛ کێشانە دواوە؛ وێ کێشتەیوە دماوە؛ دەست بەردان لە کارێک.
**پا پیچ شدن** ☜ **پاپیچ**
**پا پی شدن** ☜ **پاپی**
**پا پیش گذاشتن:** *[کنایی]* چاک وە لادا کردن؛ پا نیانە بەرەو؛ دەست وە پێش

خستن؛ دەس ئەو وەلێ وسەی؛ دەس وسەی وەلێ؛ ئامادە بوون بۆ جێبەجێ کردنی کارێک.

**پا توی کفش کسی کردن:** *[کنایی]* پێ کردنە نێو پێڵاوی کەسێکەوە: ١. دەس لە کاری کەسێ وەردان/ وەرنان؛ دەس بردنە ناو کاری کەسێکەوە ٢. ئازاردانی کەسێک.

**پا جای پای کسی گذاشتن:** *[کنایی]* پێ نانە جێی پێی کەسێکەوە؛ پەیڕەوی کەسێ کردن؛ حەولدان بۆ جێگەی کەسێک گرتنەوە ‹حالا دیگر پایش را گذاشته جای پای پدرش: ئێستە ئیتر پێی ناوەتە جێ پێی بابی›.

**پا جور کردن:** *[مجازی]* هاوڕێ پەیدا کردن ‹چند تا پا جور کنیم روز جمعه برویم کوه: چەند هاوڕێ پەیدا کەین ڕۆژی هەینی بچین بۆ کێو›.

**پا خوردن:** پێ خواردن؛ کوتیان؛ شێلیان؛ پێ‌کەوتن؛ پا واردەی؛ پا کەوتەی؛ لە ژێر پێ کەوتن ‹این فرش زیاد پا خورده است: ئەم قاڵیە زۆری پێ خواردووە›.

**پا دادن:** *[مجازی، گفتاری]* دەس‌دان؛ ڕەخسان؛ لوان ‹تا به حال تنها یکبار برایش پا داده که با او تنها باشد: تا ئێستا تەنیا جارێک بۆی دەسی داوە دەگەڵی تەنیا بێ›.

**پا در گل ماندن:** *[کنایی]* لە قوڕ چەقین؛ تووشیاری گیر و گرفت بوون ‹همین طور پا در گل مانده بودم و راهی نمی‌دیدم: هەروا لە قوڕ چەقیبووم و ڕێگایەکم بەدی نەدەکرد›.

**پا را از گلیم خود درازتر کردن:** *[کنایی]* پای زیادی داکێشان؛ دەس دان بە کارێکەوە کە لە وزەدا نەبێ ‹پایش را از گلیمش درازتر کرده: پای زیادی داکیشاوە›.

**پا را به زمین کوبیدن:** ڕک کردن؛ وڕک کردن؛ وڕگ گرتن ‹گریه می‌کرد و پایش را به زمین می‌کوبید که مادرم را می‌خواهم: دەگریا و ڕکی کردبوو کە دایکم دەوێ›.

**پا را زدن:** پێ گرتن؛ پا گرتن/ گێرتەی ‹کفش تازه پایم را می‌زند: کەوشە تازەکە پێم دەگرێ›.

**پا را کج گذاشتن:** *[کنایی]* پێ لار دانان؛ پا لار نیان؛ کاری نەگونجاو کردن ‹اگر پایت را کج بگذاری من می‌فهمم: ئەگەر پێت لار دانێ، من دەزانم›.

**پا روی حق گذاشتن:** *[مجازی]* پا نان بە سەر ڕاستیدا؛ کەتمان کردن ‹نباید پا روی حق گذاشت، او آدم خوبی است: پیاوێکی چاکە، نابێ پێ بە سەر ڕاستیدا بنێین›.

**پا روی دم کسی گذاشتن:** *[مجازی]* پێ بە کلکی کەسێکدا نان؛ چێوەختە دانی کەسێک؛ ڕەنجاندنی مرۆی لار و نالەبار ‹مواظب باش پا روی دمش نگذاری، آدم بدپیله‌ای است: ئاگات لێ بێ پێ نەنێیی بە کلکیدا، مرۆیەکی تووشە›.

**پا زدن:** ١. پاکوت کردن؛ پێ شێل کردن ٢. پا لێدان؛ پێ‌دان؛ پادەی؛ جووڵاندنەوەی بەردەوامی پێ (وەک کاتی دووچەرخەسواری یان مەلە کردن).

**پا سبک کردن:** *[مجازی]* ١. وچاندان؛ ماندوویی دەرکردن؛ شەکەتی دەرکردن؛ حەسانەوە ٢. زایین؛ زەی.

**پا سست کردن:** *[مجازی]* پا شل کردنەوە؛ پا شلەوکردن؛ سنەسن کردن؛ پا وسەی ‹پا سست کردم، بلکه او هم برسد: پام شل کردەوە، با ئەویش بگا›.

**پا شدن:** هەستان؛ هەڵسان؛ ڕابوون: ١.

راستەوە بوون ‹پاشو بایست: هەستە راوەستە› ٢. لە خەو هەستان؛ خەبەر بوونەوە؛ هەیوە بیەی ‹صبح زود پا شدم: بەیانی زوو هەستام›.

**پا کردن:** *[گفتاری]* لە پێ کردن؛ کردنە پا (پێلاو؛ گۆرەوێ، پانتۆل و...).

**پا گذاشتن:** پێ نان؛ پا نیان؛ پانان؛ پا نیەی: ١. چوونە ناو ‹تا پا گذاشت توی حیاط... : تا پێی نایە نێو حەوشەوە ...› ٢. دەست پێ کردن؛ وازیەی؛ چوون ‹پا گذاشته بود به سی سال: پێی نابووە نێو سی ساڵەوە›.

**پا گرفتن:** *[مجازی]* دامەزران؛ پاگرتن؛ سەرگرتن ‹سرانجام عروسی پا گرفت: ئاخری شاییەکە دامەزرا›.

**پای خود را کنار/ عقب کشیدن:** پاکێشانەوە؛ پێ کشانەوە؛ خۆکێشانەوە و دەس تێوەرنەدان لە کارێکدا ‹تو پایت را از این ماجرا کنار بکش: تۆ لەم کارە پات بکێشەوە›.

**پایش افتادن:** بۆ ڕەخسان؛ بۆ لوان؛ بۆ ڕێک کەوتن؛ پەی ڕێک کەوتەی؛ هۆ و دەرفەتی کارێک بۆ ڕەخسان.

**پای کسی از جایی بریده شدن:** *[مجازی]* پا بڕیانی کەسێک لە شوێنێک؛ ڕێگای هاتوچووی کەسێک بۆ شوێنێک نەمان ‹پای عروس از خانه مادر شوهرش بریده شد: پای بووکەکە لە ماڵە خەزوورانی بڕا›.

**پای کسی/ چیزی ایستادن/ بودن:** لە سەر شتێ یان کەسێک بوون/ ڕاوەستان ‹من پای حرفم ایستاده‌ام: من لە سەر قسەی خۆم ڕاوەستاوم›.

**پای کسی به جایی باز شدن:** *[مجازی]* پێ کەسێ کرانەوە بۆ شوێنێک؛ دەست پێ کردنی هاتوچووی کەسێک بۆ شوێنێک ‹از وقتی پایش به خانهٔ ما باز شد...: لەکاتێکەوە پێی بە ماڵی ئێمە کرایەوە ...›.

**پای کسی را از جایی بریدن:** ١. پێی کەسێک لە جێگایێک بڕینەوە؛ بڕینەوەی پای کەسێک ‹پایش را از زانو بریده‌اند: پێیان لە وژنگەوە بڕیوەتەوە› ٢. *[مجازی]* پێ کەسێ لە شوێنێک بڕین؛ هاتوچووی کەسێک لە شوێنێک نەهێشتن ‹پای مادر شوهر را از خانەی پسرش برید: پێی خەسووی لە ماڵی کوڕەکەی بڕی›.

**پای کسی را به میان/ وسط کشیدن:** کەسێک پێوە تلاندن؛ پێوە پێچاندنی کەسێک؛ ئاوێتەکردنی کەسێک؛ تێوەگلاندنی کەسێک؛ پێوە تلنەی ‹در آن دعوا پای من را هم به میان کشیدند: لەو شەڕەدا منیشیان پێوە تلاند›.

**پای کسی سبک بودن:** *[مجازی]* پای کەسێک سووک بوون؛ پای کەسێ خێر بوون؛ پای کەسێک خاس بوون ‹پای شما سبک بود، تا آمدید، مشتریها ریختند توی مغازه: پات سووک بوو، تا هاتی، کڕیارانی زۆر ڕژانە دووکانەوە›.

**پای کسی سست شدن:** پێ کەسێ شل بوونەوە؛ خاو بوونەوە؛ پەرگەماو یۆی خاوەوە بیەی ‹با شنیدن این حرف پایم سست شد و از رفتن باز ماندم: کە ئەم قسەیەم بیست پێم شل بووەوە و لە ڕۆیین مامەوە›.

**پای کسی نوشتن/ گذاشتن:** *[مجازی]* نووسینە پای کەسێک؛ خستنە پای کەسێک؛ ‹این را می‌نویسم به پای تو: ئەمە دەخەمە پای تۆ›: **به حساب کسی گذاشتن/ نوشتن**

**از پا در آمدن/ افتادن:** *[مجازی]* لە پا

کەوتن؛ لە پێکەوتن؛ وره بەردان؛ جە پەیکەوتەی: ١. تێکشکان؛ شکست خواردن؛ بۆڕ خواردن؛ شکان ‹دشمن از پا درامد: دوژمن تێک شکا› ٢. لە وزه کەوتن؛ هێز نەمان؛ شەکەت بوون؛ پا وستەی؛ پا خستن ‹اسب بیچاره از پا درامد: ئەسپە داماوەکە لە وزه کەوت›.

**از پا درآوردن**: *[مجازی]* لە پا خستن؛ لە وزه خستن؛ لە وره خستن؛ پا وستەی؛ شکست دان؛ لە جموجووڵ خستن ‹دشمن را از پا درآورد: دوژمنی لە پا خست›.

**از پا ننشستن**: *[مجازی]* وچان نەدان؛ دانەنیشتن؛ لە هەوڵ و تێکۆشان دەس بەر نەدان ‹تا پیروزی از پا ننشست: تا سەر نەکەوت وچانی نەدا›.

**این پا آن پا کردن** ☜ **این**[1]

**با پای خود رفتن**: بە پێی خۆ چوون؛ بە پاو وێ لوەی؛ بە ویست و خواستی خۆ کارێکردن یان بۆ شوێنێک ڕۆیشتن ‹با پای خودش رفت بە کلانتری و تسلیم شد: بە پێی خوی چوو بۆ کەلانتەری و خۆی دا بە دەسەوه›.

**بە پای کسی سوختن**: *[مجازی]* بە دیار کەسێکەوه سووتان؛ بە بۆنەی چاوەڕوانی یان چاوەدێری لە کەسێک، خۆشی ژین لە خۆ قەدەغە کردن: **پاسوز کسی شدن**

**بە پای کسی/ چیزی نشستن**: *[مجازی]* بە تەمای کەسێ یان شتێکەوه مان/ دانیشتن؛ نیشتنە دیار کەسێکەوه؛ بە پێی کەسێکەوه دانیشتن؛ چەمەڕا و یۆی بیەی ‹دو سال بە پای آزاد نشستم تا از سربازی برگردد: دو ساڵ نیشتمە دیار ئازادەوه تا لە سەربازی بگەڕێتەوه›.

**دو پا داشتن و دو پا هم قرض کردن** ☜ **دو**[2]

**روی پا بند نبودن** ☜ **رو**[2]

**روی پای خود ایستادن** ☜ **رو**[2]

**زیر پا گذاشتن** ☜ **زیر**[3]

**زیر پای کسی نشستن** ☜ **زیر**[3]

**هردو پا را در یک کفش کردن** ☜ **هر**

**یک پا گیوه و یک پا چارق** ☜ **یک**[2]

**یک پا لب‌گور داشتن** ☜ **یک**[2]

**یک پای کاری لنگیدن** ☜ **یک**[2]

**ـــ پا**[2]: *پیواژه* ١. ـــ ئەوان؛ ـــ وان؛ ـــ ڤان؛ چاوەدێر؛ نگابان؛ چەمدار ‹باغ‌پا: باخەوان› ٢. پێ؛ پا ‹چهارپا: چوارپێ›.

**پاافزار** / pā'afzār/ ☜ **پای‌افزار**

**پاانداز** / pā'andāz/، ـها/: *اسم* ١. *[گفتاری]* دەلاڵ؛ دەراڵ؛ وەشکەر؛ کەسێ کە ژن و پیاو بۆ یەکتر تاو دەکا ٢. *[نامتداول]* پایەنداز؛ پایەناز؛ ژێرڕاخەر.

**پااندازی** / pā'andāzî/: *اسم*. دەلاڵی؛ کاری دەلاڵ.

**پائی** / pā'î/ ☜ **پایی**

**پائیدن** / pā'îdan/ ☜ **پاییدن**

**پائیز** / pā'îz/ ☜ **پاییز**

**پائیزه** / pā'îze/ ☜ **پاییزه**

**پائین** / pā'în/ ☜ **پایین**

**پائینی** / pā'înî/ ☜ **پایینی**

**پابرجا** / pābarcā/: *صفت*. *[گفتاری]* پتەو؛ قایم؛ بەردەوام؛ پایدار؛ پاوەجێ. بەرانبەر: **پادرهوا** ‹قرارمان هنوز پابرجاست: بەڵێنەکەمان هەر بەردەوامە›.

**پابرجائی** / pābarcā'î/ ☜ **پابرجایی**

**پابرجایی** / pābarcāyî/: *اسم*. بەردەوامی؛ پاوەجێیی؛ پێبەرجێیی؛ پایداری؛ ڕاوەستاوی؛ وەستاوی: **پابرجائی**

**پابرنجن** / pābarancan/، ـها/: *اسم*. *[ادبی]* پاوانە؛ پامۆره؛ خرخاڵی پێ (لە زێڕ و زیو)؛

بازنەی پێ.

**پابرهنه**[1] / pāberahne, -berehne/، ـها؛ ـگان/: *صفت.* پاپەتی؛ پێپەتی: ١. وارواى؛ واربای؛ پێخواس؛ پێخاوس؛ پاخراو؛ پێ ڕووت؛ بێ پێڵاو؛ پاوروا؛ پاورا؛ پاوەروا ‹پابرهنه راه می‌رفتم: پێخاوس بە ڕێدا دەڕۆیشتم› ٢. *[مجازی]* هەژار؛ دەس‌خاڵی ‹این مملکت مال مردم پابرهنه و زحمتکش است: ئەم ولاتە هی خەڵکی هەژار و زەحمەتکێشە›.

**پابرهنه**[2]: *قید.* بە پێخاوسی؛ بە پای ڕووتەوە؛ بە پای پەتی؛ پاوەروایی؛ بەبێ کەوش ‹پابرهنه راه می‌رفت: بە پێخاوسی دەچووە ڕێوە›.

⊡ **پابرهنه وسط حرف کسی دویدن:** *[مجازی]* دانە ناو قسەی کەسێکدا؛ پەڕینە ناو قسەی کەسێک؛ قسە بە کەسێک برین ‹بگذار حرفم را بزنم، این‌قدر پابرهنه وسط حرف من ندو: بێڵە با قسەکەم بکەم، کەم بەرە ناو قسەکەمدا›.

**پابست** / pābast/: *صفت. [کنایی]* گیرۆدە؛ هۆگر؛ ئۆگر؛ هوکارە؛ پابەند؛ پێبەند؛ پابەس؛ خوو پێ گرتوو.

**پابند**[1] / pāband/: *اسم.* پاوەن؛ پێبەند؛ پاشوەن؛ پابەند؛ یەکدەسی؛ یەکدەس؛ ئەشکێل؛ سندم؛ ئاڵقەیەک کە بۆ ڕاگرتنی چارەوێیان بە پایانەوە دەبەسترێ: **بخو**

**پابند**[2]: *صفت. [گفتاری]* گیرۆدە؛ پێبەس؛ پێوەند؛ پێ‌بەند؛ پابەند ‹صد دفعە گفتم خودت را پابند این دختر نکن: سەد جار گوتم خۆت گیرودەی ئەم کچە مەکە›.

**پابوس** / pābûs/: *اسم. [گفتاری]* پابۆس: ١. *[نامتداول]* کاری ماچ کردنی پای کەسێک ٢. *[مجازی]* دەربڕینی خاکەساری لە هەمبەر کەسێکەوە ‹بە پابوس کسی رفتن: چوون بۆ پابوسی کەسێک› ❋ **پابوسی**

**پابوسی** / pābûsî/ ☜ **پابوس**

**پابەرکاب**[1] / pāberekāb/: *صفت. [کنایی]* تەیار؛ پاوەکڵاش؛ وەنگەگۆش؛ تەیار بۆ چوون ‹او همیشه پابەرکاب بود: هەموو کاتێک پاوەکڵاش بوو›.

**پابەرکاب**[2]: *قید. [کنایی]* پاوەکڵاش؛ تەیار ‹پابەرکاب می‌خوابید: پاوەکڵاش دەخەوت›.

**پا بەماه** / pābemāh/: *صفت. [گفتاری]* پاوەمانگ؛ نۆمانگ؛ سەرحامیلە؛ تایبەتمەندی ژنی دوگیان لە مانگی ئاخری دووگیانیدا.

**پاپ**[1] / pāp/، ـها؛ ـان/: [فرانسوی] *اسم.* پاپ: ١. پاپا؛ مەزنی خاچپەرستان ٢. [انگلیسی] جۆرێ مووسیقای ڕۆژئاوایی کە زیاتر دەنێو لاواندا باوە.

**پاپ**[2]: *صفت.* پاپ؛ دانستەی مووسیقای ڕۆژئاوایی.

**پاپا** / pāpā/: [فرانسوی] *اسم.* باوە؛ باوا؛ بابا؛ بابە؛ بابەلێ؛ بابەڵێ؛ باوالێ؛ تاتەلە.

**پاپاخ** / pāpāx، ـها/: [ترکی] *اسم. [نامتداول]* پاپاخ؛ کڵاوی لە پێستی مەڕ و بزن.

**پاپاسی** / pāpāsî، ـها/: *اسم. [گفتاری]* پەنابا؛ پەناوا؛ شایی؛ قەران؛ نیکل؛ پارەی زۆر کەم‌بایی ‹این دیپلم تو یک پاپاسی نمی‌ارزد: ئەم دیپلۆمەی تۆ پەنابایەک ناهێنێ›.

**پاپتی** / pāpatî، ـها/: *صفت. [گفتاری]* ١. پێخواس؛ پێخاوس؛ پێپەتی؛ پاپەتی؛ پاوەروا ٢. *[کنایی]* نەفام؛ تێنەگەییشتوو.

**پاپردەدار** / pāpardedār، ـها؛ ـان/: *صفت. [زیست‌شناسی]* پاپەردەدار؛ خاوەن پای وەک پاڕۆک کە قامکان بە پێستێکی پەردەئاساوە، پێکەوە لکاون (وەک پای سۆنە و مراوی).

**پاپلک** / pāpalak/: *اسم. [گفتاری]* چینە؛ پێکۆڵ؛ کار یان ڕەوتی ژێر و بان کردنی

خاک و خۆڵ و زبڵ بە پێ.

**پـــاپوش** / pāpûš، ـهــا/: اسـم. پــاپۆش: ١. پێلاو؛ پالا؛ پالێ؛ ئـەوەی کـە لـە پێـی دەکـەن (وەکــوو پــووزەوانــە، پۆزلــەخ، گــۆرەوێ، کــەوش، کــلاش، گالــۆش و ...) ٢. دەرپــێ؛ شــواڵ؛ پاوەرێ ٣. [کنایی] پیلان.

▣ **پـاپوش دوخـتن**: [کـنایی] پـیلان نانـەوە؛ پاپۆش دروستکـردن؛ دمبـاڵ چنیـەی؛ بـە نـارەوا بەڵـگەی تاوانبـاری بـۆ کەسـێک دروستکـردن ‹رییس برایش پاپوش دوخت و روانەی زندانش کـرد: سـەرۆک پیلانی بـۆ نایـەوە و خستیە بەندیخانەوە›.

**پـــاپی** / pāpey/: صــفت. [گفتــاری] ســوور؛ پێداگر؛ پاپەی؛ پاگەز؛ پاپە؛ پەیگیر.

▣ **پاپی شدن**: لـە سـەر چـوون؛ پاپـەی بـوون؛ پـەیگـیر بیـەی؛ لـە دووی شـتێ کـەوتـن و زۆر لە سەری سوور بوون.

**پـاپیچ** / pāpîč/: صفت. [کنـایی، گفتـاری] پـاپێچ؛ لنگپێچ؛ هۆی زەحمەت و دەردیسەر.

▣ **پـاپیچ شـدن**: پـاپێچ بـوون؛ بوونـە هـۆی زەحمەت و دەردیسەر.

**پـــاپیروس** / pāpîrûs، ـهـــا/: [لاتینـــی] اســم. تەرکـە؛ قـەڕەن؛ پـاپیرووس؛ پـەڕەی گیایـەکـە یـەکـەم جـار پـەڕەی کاغـەزیـان لـێ دروست کردووە: **بَردی**

**پـــاپیون** / pāpiyon، ـهــا/: [فرانــسوی] اســم. پاپیۆن؛ پارچـەیـەکـی زۆرتـر پـەپوولـە ئاسـایە کە بە بەن یـان کـێش، بـە یـەخـە یـان قـژەوە دەیبەستن.

**پــــاپیونی** / pāpiyonî/: [فرانــــسوی] صــــفت. پاپیۆنی؛ وەکوو پاپیۆن؛ پەپوولەئاسا.

**پات** / pāt/: صفت. پـات؛ قـەتـیس؛ بـێ جووڵـە مانەوە لە شەترەنجـدا. هـەروەهـا: **پـات بـودن؛ پات شدن؛ پات کردن**

**پاتابــه** / pātābe، ـهـا/: اسـم. پێتـاو؛ پێتـاوە؛ پاتاوە؛ زەنگاڵ؛ زەرگـاڵ؛ لاچـین؛ بـەلـەکپـێچ؛ پاپێچ؛ پووزەوانە؛ پووزەوانێ.

**پاتـاق** / pātāq/: اسم. [معماری] پاتـاق؛ ژێرتـاق؛ ژێر دەمی میچی خانوو.

**پاتال** / pātāl/ ☜ **پیرُوپاتال**

**پاتـــان** / pātān/: اسـم. پاتــان: ١. نــەتــەوەی سـپی پێـستی پـەشـتووزمانی نیـشتەجێـی پاکستان و ئـەفغانـستان ٢. ـهـا/ هـەرکـام لـە خەڵکی ئەو هۆزە.

**پاتختی** / pātaxtî/: اسم ١. ـهـا/ پـێ تـەخـتی؛ پاتــەخــتی؛ مێــزی بچــووک کــە لــە پــاڵ جێگــەخــەودا دایــدەنــێن ٢. ســێ ڕۆژە؛ سێڕۆژانـە؛ پـاش تێلانـە؛ ناوتێلانـە؛ سـەرتـەل؛ سـەرکێـشی؛ یـەکـەم سـەردان لـە بـووک لـە ماڵی نوێیدا.

**پاتـک** / pātak، ـهـا/: اسم. [نظامی] بـەرپـەرچ؛ پلارێـک بـەرامبـەر بـە پـەلامـاری دوژمـن ‹آن شب به دشمن پاتک زدیم: ئـەو شـەوە بـەرپـەرچـی دوژمنمان دایەوە›.

**پـاتوق** / pātûq, pātoq، ـهـا/: [فارسـی/ ترکـی] اسم. پاتۆق؛ مەکـۆ؛ سـاویر؛ پـەنـا؛ لان؛ لـەهـن؛ هرزێن؛ شـوێنی کـۆبوونـەوە؛ شـوێنێ کـە جـار و بارە برێ کەسان کـاتی وچانیـان لـەوێـدا بـە سەر دەبەن ‹یک وقتی پاتوق ما قهوەخانەی آینە بود: سەردەمێـک پـاتوقی ئێمـە قـاوەخانـەی ئاوێنـە بوو›.

**پاتـه** / pāte/: [فرانسوی] اسم. شـڵپاو؛ خـۆراکی جەرگ و ڕۆن و ڕبی هەنار.

**پـاتی** / pātî/: [؟] اسـم ١. کـوتراو؛ پـاککـراو؛ بـزاردە؛ دانـە خـەڵـەی بووجـاڕکراو ٢. پـاتی؛ بارێک لە یاری شەترەنجدا کـە بـە بـێ ئـەوەی لایەنێـک بیباتـەوە دوایـی بـە یاریـەکـە دێنـێ ٣. ☜ **قاتیپاتی**

**پاتیـل**[1] / pātîl، ـهـا/: [سنـسکریت] اسـم. قـازان؛ قازانـگ؛ قازانــە؛ تیانــە؛ بــەرۆش؛ بــەرۆشــی

مس؛ مەنجەڵی زۆر گەورە و قووڵی مسی.

**پاتیل**[2]: *صفت.[گفتاری]* تەلەس؛ ڕەشەمەست؛ مەستیمەست؛ سیامەس.

▣ پاتیل بودن: ڕەشەمەست بوون؛ تەلەس بوون؛ مەستیمەست بوون.

**پاتیلدررفته** / pātîldar.rafte، ـهـا/: [سنسکریت/ فارسی] *صفت.[گفتاری، کنایی]* لێکەوتی؛ لێکەوتوو؛ لێکەفتگ؛ لاکەوتە؛ ڕەندول؛ ڕەندۆڵ؛ گەردەنشین؛ پیروپاتاڵ؛ پەڕووپاتاڵ؛ چۆنیەتی زورهانی و لەکار کەوتوویی.

**پاتین** / pātîn، ـهـا/: [؟] *اسم.[کشاورزی]* شەن؛ شەنە؛ سێزن؛ سێلک؛ سێلکە؛ سێلق؛ داری چوار چنگی خەرمان بە بادان.

**پاتیناژ** / pātînāj/: [فرانسوی] *اسم.* پاتیناژ؛ خزخزەکانێ لە سەر یەخ.

**پاجوش** / pācûš، ـهـا/: *اسم.* لاوەچ؛ قوونار؛ نەمام یان چڵێک کە لە نزیکی قەدی بڕێک لە داران، لە ڕیشەیانەوە سەر هەڵدەدەن.

**پاچله** / pāčele، ـهـا/: *اسم.* کەمانە؛ کەمانێ: ١. چێو خلیسکان؛ چێو ئیسکی؛ چێو لەنگەر ٢. چێوشەقە؛ چێوشەق؛ شەقەقە؛ یاریدەری شەل یان سەقەت بۆ بەڕێوە چوون.

**پاچنبری** / pāčambarî, -čanbarî، ـهـا/: *اسم.* گۆج؛ گوچ؛ کۆڵ؛ لنگ کەڤانی: **گُرزەپایی**

**پاچه** / pāče، ـهـا/: *اسم.* پێچک؛ قاچک؛ پەپک؛ پاچە؛ پاچک: ١. پچک؛ لە ئەژنۆ هەتا گوێزنگ ٢. پاچە؛ کەڵوپا؛ پاچەی ئاژەڵ لە چێشتی سەروپێدا ٣. دەرپێ؛ دەرپاچە؛ دەرقاچە؛ دەرپا؛ بنپاچە؛ پاچک؛ دەلنگ؛ دەلینگ؛ هەلینگ؛ لای خوارووی قاچ و دەرپێ.

▣ پاچەی کسی را گرفتن: *[تعریض]* قاچ کەسێک گرتن؛ پێش بە کەسێک گرتن؛ بەر بە کەسێک گرتن؛ پاچەی کەسێ گرتن؛ ڕێ لە کەسێک گرتن؛ یەخەی کەسێ گرتن؛ شەڕ بە کەسێک فرۆشتن؛ بەرۆکی کەسێک گرتن؛ بەرەک بە کەسێ گرتن؛ وەرەڕا و یۆی گێرتەی؛ بەرەکە بە یۆی گێرتەی ‹امروز هم می‌خواست پاچەی مرا بگیرد، کە زود فرار کردم: ئەمڕۆش دەیویست قاچم بگری، بەڵام زوو دەرچووم›.

هەروەها: **پاچه گرفتن**

**پاچەخیزک** / pāčexîzak، ـهـا/: *اسم.* جۆرێک فشفشەیە کە کاتێ هەڵیدەکەن بە دەور خۆیدا دەسووڕێتەوە.

**پاچەورمالیده** / pāčevarmālîde، ـهـا/: *صفت.[گفتاری]* ڕووهەڵماڵاو؛ ڕووداماڵیاگ؛ لنگ هەڵماڵیاگ؛ بێحەشر و نەشر؛ بێئاوروو؛ چەقەسۆ؛ قرشماڵ؛ گۆسارتمە.

**پاچین** / pāčîn، ـهـا/: *اسم* ١. داوێن؛ دامێن؛ دامنە ٢. *[معماری]* پادیوار؛ پێچن؛ ئەو پاژە لە دیوار کە دەکەوێتە سەر بنەڕەتەوە.

**پاخوره** / pāxore، ـهـا/: *اسم.[معماری]* خواجانە؛ خواجەنشین؛ سەکۆی پەنادەرکی ماڵ بۆ دانیشتن.

**پاد ـــ** / pād/: *پیشوند.* دژەـــ ؛ دژـــ ؛ بە ڕەوت یان کاری بەپێچەوانەوە ‹پادزهر: دژەژار›.

**پاداش** / pādāš، ـهـا/: *اسم.* پاداش؛ پاداشت؛ ڕێزانە: ١. خەڵات؛ چاکەدانەوە لە بەرانبەر چاکەکاری بە نیشانەی پێزانین یان هاندان ‹پاداش صداقت، اعتماد است: پاداشی ڕاستبێژی، جێباوەڕ بوونە› ٢. پارە و مافێک کە مووچەخۆر یان کرێکار جگە لە حەقی ڕۆژانەی یان مافی ئاسایی خۆی وەریدەگرێ ‹هر ماه ـ علاوه بر حقوق ـ پاداش هم می‌دهند: گشت مانگێک ـ جگە لە مووچەـ

پاداسیش دەدەن› ٣. /[ادبی]/ وەرام؛ ولام؛ جواو؛ جەزا؛ بژاردنەوە؛ پەرسڤ؛ کارێ کە لە هەمبەر کارێکی دیکەوە دەکرێ ‹کلوخانداز را پاداش سنگ است: کلۆسەهاوێژ وەرامی بەردە›.

**پادرختی** / pāderaxtî، ـها/:/اسم. باوەرێن؛ بارێز؛ بارێزە؛ وارێزە؛ بارن؛ باقەرینگ؛ میوەی داوەریوی پای دار ‹بچەها پادرختی‌ها را می‌خوردند: منداڵەکان باوەرینەکانیان دەخوارد›.

**پادرد** / pādard/ ☜ ـ درد[٢]

**پادرمیانی** / pādarmiyānî، ـها/:/اسم. /[گفتاری]/ ناوبژیوانی؛ ناوجی‌گەری؛ ناونجی‌گەری؛ نێونجی‌گەری. هەروەها: **پادرمیانی کردن**

**پادرهوا** / pādarhavā/: صفت. /[کنایی]/ سست؛ بێبتە؛ خۆ ڕانەگر؛ تەق‌ولەق؛ تەقەسم ‹کارم در اداره پادرهواست و ممکن است بیرونم کنند: کارم لە مەزرینگەدا تەق‌ولەقە و دوور نیە دەرم کەن›.

**پادری** / pādarî، ـها/:/اسم. بەرپێیی؛ وەرپایی؛ ئەو قالیچە و ڕایەخە کە لەبەر دەرگادا ڕایدەخەن.

**پادزهر** / pādzahr، ـها/:/اسم. ژاربەر؛ ژاربر؛ دژەژار؛ دەرمانی ژار.

**پادزیو** / pādzîv/:/اسم. ئانتی‌بیوتیک؛ دەرمانی چلک و قرێژ وشک‌کردن.

**پادشاه** / pād(e)šāh، ـان/:/اسم. پاشا؛ پاوشا؛ پاتشا؛ پادشا؛ پالشا؛ پالشا؛ شا؛ خوونکار؛ قراڵ؛ قەراڵ؛ قەیسەر؛ سەرناوی شا و سوڵتان.

**پادشاهی** / pād(e)šāhî، ـها/:/اسم. پاوشایی؛ پاشایەتی؛ شایەتی؛ پاتشایەتی؛ پالشایەتی؛ شایی؛ شاهی؛ خوونکاری.

▣ پادشاهی کردن: ١. پاوشایی کردن؛ خوونکاری کرن ٢. /[کنایی]/ خۆش ڕابواردن؛ کەیفساز بوون.

بە پادشاهی رسیدن: بوونە پادشا؛ بە پاتشایی گەییشتن؛ بیەی بە شا.

**پادگان** / pād(e)gān، ـها/:/اسم. سپاگە؛ سپاخانە؛ سوپاخانە؛ سەربازگە؛ سەروازخانە؛ سەربازخانە؛ دەبۆ؛ بنکەی سەربازان؛ بنکەی چەکدارانی دەوڵەت.

**پادنگ** / pādang، ـها/:/اسم. پادەنگ؛ دنگ؛ دەسک؛ دنگی پایی؛ جۆرێک ئامرازی دەخڵ‌کوتان کە بە پێیان دەگەڕێ.

**پادو** / pādo:، ـها/:/اسم. پاکار؛ پادەو؛ پەتیک؛ بەردەست؛ هۆکڵ؛ کارەکەر؛ کاریگەرێک کە لە بەر دەستی خاوەنکاردا کار دەکا و هەر لە هاتوچۆ دایە.

**پادوئی** / pādo'î/ ☜ **پادویی**

**پادویی** / pādoyî/:/اسم. پاکاری؛ پەتیکی: ١. پیشەی پاکار ‹آنجا پادویی می‌کرد: لەوێدا پاکاری دەکرد› ٢. /ـها/ /[مجازی]/ کاری دژوار و چرووک ‹پادویی این و آن تاکی؟: پەتیکی خەڵکی تا کەنگێ؟› ❊ **پادوئی**

**پارابلوم** / pārāblom/: [فرانسوی از آلمانی] /اسم. پارابلۆم؛ ناوی جۆرێ دەمانچەی تۆپی.

**پارادایم** / pārādāym/: [؟]/اسم. وێنە؛ نموونە؛ شتێ کە نیشاندەری کۆمەڵی وەک خۆیەتی.

**پارادکس** / pārādoks/:/اسم. ناتەبایی؛ نارێکی: ١. وتراوەیەک کە لە ڕواڵەتدا بەپێچەوانەی ویستی ئاوەزە، ئەگەرچی دەکرێ ڕاستیش بێ ٢. وتەیەکی ناتەبا کە لە سەرەتاوە ڕاست دەنوێنێ.

**پارازیت** / pārzît، ـها/: [فرانسوی]/اسم ١. لامز؛ لاکوت؛ چەورە ٢. دەنگی زیادی و ئازاردەر.

▣ پارازیت دادن: پارازیت خستن؛ دەنگی ئازاردەر (وەک خشەخش یان قیرە و هەرا)

هێنانە ناو قسە و باسەوە ‹بابا اینقدر پارازیت نده: کاکە هێندە پارازیت مەخە›.

**پاراشوت** / pārāšût، ـها/: [فرانسوی]/اسم. چەتری دەرباز بوون؛ ساباتی ڕزگاری؛ چەترێک کە لە کاتی پێویستدا لە ئاسمانەوە دەیکەنەوە و بە نەرمی دێنەوە سەر زەوی.

**پاراف** / pārāf/: [فرانسوی]/اسم. ئیمزا؛ واژۆ ‹وقتی حکم پاراف شد، ببر بە طرف ابلاغ کن: کاتێ حوکمەکە ئیمزا کرا، بیبە بە کابرای ڕاگەینە›.

**پارافین** / pārāfîn، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] پارافین؛ جۆرێک چەوریە لە نەوت چێ دەکرێ و پێستی دەست و ڕوومەتی پێ چەور و نەرم دەکەن.

**پاراگراف** / pārāg(e)rāf، ـها/: [فرانسوی]/اسم. بەند؛ بەشێک لە نووسراوە کە زۆرتر لە مەڕ بابەتێکەوەیە و بە دەسپێکردنی دێری تازە، لە بەشگەلی‌تر جوێ دەبێتەوە.

**پارالل** / pārālel، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پاراڵێل؛ کەرەسەی وەرزشی ژیمناستیک کە لە دوو میلەی بەرانبەر بە یەک لە سەر پایەگەلێک دانراوە.

**پارانوئید** / pārāno'îd/: [فرانسوی] ☜ **پارانویایی**

**پارانویا** / pārānoyā/: [فرانسوی]/اسم. [روانشناسی] پارانۆیا؛ چەشنێک پەرێشانی ڕەوانی بەردەوام و درێژەدار کە نەخۆش تووشی بەرزەفڕی یان گومان‌خراوی دەکا، بەلام بەشەکانی دیکەی کەسایەتی ئەو نەخۆشە وەک خۆیان دەمێننەوە.

**پارانویائی** / pārānoyā'î/: [فرانسوی] ☜ **پارانویایی**

**پارانویایی** / pārānoyāyî/: صفت. [روانشناسی] پارانۆیایی؛ تووشی پارانۆیا: **پارانوئید؛ پارانویائی**

**پاراوان** / pārāvān، ـها/: [فرانسوی از ایتالیایی]/اسم. پەردە؛ پەردۆ؛ دیوارۆک؛ دیوارئاسای جوێ‌کەرەوەی هۆدە و ئوتاغێکی ناوماڵ لە بەشەکانی‌تر.

**پارت** / pārt، ـها/:/اسم. پارت؛ هۆزێکی کەونارا کە دە ناوەندی خۆراساندا دەژیان و وەک ئێژن، دەوڵەتی ئەشکانیان دامەزراند.

**پارتی** / pārtî، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پارتی: ١. واسیە؛ واستە؛ داژدار؛ پشتگر؛ پشتەمێر؛ پاڵ‌پشت؛ لایەن‌گیر؛ هەواخواز؛ پشتیوان؛ لایەنگری بە دەستەلات ٢. جۆرێک میوانی بە شێوەی ڕۆژاوایی هاوڕێ لەگەڵ سەما و مۆسیقادا ٣. ئەو کالایە کە بە یەکجاری دەگاتە دەستی کڕیار ‹دیروز یک پارتی از این کفشها رسید: دوێنێ پارتیەک لەم کەوشانە گەییشت›.

▣ **پارتی کلفت:** پارتی کەلەقەوی؛ پارتی دەسچوو ‹پارتی حَسَن کلفت است: پارتی حەسەن کەلەقەویە›.

▣ **پارتی تراشیدن:** پارتی نانەوە ‹برای استخدام، دە تا پارتی تراشید: بۆ دامەزران، دە دانە پارتی نایەوە›.

**پارتی رفتن:** چوون بۆ پارتی؛ چوونە میوانی؛ بەشداری‌کردن لە میوانیدا.

پارتی شدن: بوونە پارتی؛ پشت‌گرتن.

**پارتی گرفتن:** پارتی دان؛ پارتی ڕێک‌خستن؛ میوانی دان.

**پارتی‌بازی** / pārtîbāzî، ـها/: [فرانسوی/فارسی]/اسم. کەس‌کەسانێ؛ گۆڵساق‌بازی؛ گۆڵساخ‌بازی؛ ئاشنابازی؛ کار پێک‌هێنان بۆ خزم و ئاشنا.

**پارتیزان** / pārtîzān، ـها/: [فرانسوی]/اسم. چریک؛ پێشمەرگە؛ گریلا.

**پارتیشن** / pārtîšen، ـها/: [انگلیسی]/اسم.

هێنانە ناو قسە و باسەوە ‹بابا اینقدر پاررازیت نده: کاکە هێندە پارازیت مەخە›.

**پاراشوت** / pārāšût، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. چەتری دەرباز بوون؛ ساباتی ڕزگاری؛ چەترێک کە لە کاتی پێویستدا لە ئاسمانەوە دەیکەنەوە و بە نەرمی دێنەوە سەر زەوی.

**پاراف** / pārāf/: [فرانسوی]/اسم. ئیمزا؛ واژۆ ‹وقتی حکم پاراف شد، ببر به طرف ابلاغ کن: کاتێ حوکمەکە ئیمزا کرا، بیبە بە کابرای ڕاگەینە›.

**پارافین** / pārāfîn، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] پارافین؛ جۆرێک چەوریە لە نەوت چێ دەکرێ و پێستی دەست و ڕوومەتی پێ چەور و نەرم دەکەن.

**پاراگراف** / pārāg(e)rāf، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. بەند؛ بەشێک لە نووسراوە کە زۆرتر لە مەڕ بابەتێکەوەیە و بە دەسپێکردنی دێڕی تازە، لە بەشگەلی‌تر جوێ دەبێتەوە.

**پارالل** / pārālel، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. پارالێل؛ کەرەسەی وەرزشی ژیمناستیک کە لە دوو میلەی بەرانبەر بە یەک لە سەر پایەگەلێک دانراوە.

**پارانوئید** / pārāno'îd/: [فرانسوی] ☜ پارانویایی

**پارانویا** / pārānoyā/: [فرانسوی]/اسم. [روانشناسی] پارانۆیا؛ چەشنێک پەرێشانی ڕەوانی بەردەوام و درێژەدار کە نەخۆش تووشی بەرزەفڕی یان گومان‌خراوی دەکا، بەلام بەشەکانی دیکەی کەسایەتی ئەو نەخۆشە وەک خۆیان دەمێننەوە.

**پارانویائی** / pārānoyā'î/: [فرانسوی] ☜ پارانویایی

**پارانویایی** / pārānoyāyî/: صفت. [روانشناسی] پارانۆیایی؛ تووشی پارانۆیا: پارانوئید؛ پارانویائی

**پاراوان** / pārāvān، ـهـا/: [فرانسوی از ایتالیایی]/اسم. پەردە؛ پەردۆ؛ دیوارۆک؛ دیوارئاسای جوێ‌کەرەوەی هۆدە و ئوتاغێکی ناومال لە بەشەکانی‌تر.

**پارت** / pārt، ـهـا/:/اسم. پارت؛ هۆزێکی کەونارا کە دە ناوەندی خۆراساندا دەژیان و وەک ئێژن، دەولەتی ئەشکانیان دامەزراند.

**پارتی** / pārtî، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. پارتی: ١. واسیە؛ واستە؛ داژدار؛ پشتگر؛ پشتەمێر؛ پالپشت؛ لایەن‌گیر؛ هەواخواز؛ پشتیوان؛ لایەنگری بە دەستەلات ٢. جۆرێک میوانی بە شێوەی ڕۆژاوایی هاوڕێ لەگەل سەما و مۆسیقادا ٣. ئەو کالایە کە بە یەکجاری دەگاتە دەستی کڕیار ‹دیروز یک پارتی از این کفشها رسید: دوێنێ پارتیەک لەم کەوشانە گەییشت›.

◙ **پارتی کلفت**: پارتی کەلەقەوی؛ پارتی دەسچوو ‹پارتی حَسَن کلفت است: پارتی حەسەن کەلەقەویە›.

◘ **پارتی تراشیدن**: پارتی نانەوە ‹برای استخدام، دە تا پارتی تراشید: بۆ دامەزران، دە دانە پارتی نایەوە›.

**پارتی رفتن**: چوون بۆ پارتی؛ چوونە میوانی؛ بەشداری‌کردن لە میوانیدا.

**پارتی شدن**: بوونە پارتی؛ پشت‌گرتن.

**پارتی گرفتن**: پارتی دان؛ پارتی ڕێک‌خستن؛ میوانی دان.

**پارتی‌بازی** / pārtîbāzî، ـهـا/: [فرانسوی/فارسی]/اسم. کەس‌کەسانێ؛ گۆلساق‌بازی؛ گۆلساخ‌بازی؛ ئاشنابازی؛ کار پێک‌هێنان بۆ خزم و ئاشنا.

**پارتیزان** / pārtîzān، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. چریک؛ پێشمەرگە؛ گریلا.

**پارتیشن** / pārtîšen، ـهـا/: [انگلیسی]/اسم.

دیوارۆک؛ پەردۆ؛ سکر؛ پارتیشن؛ دیوارێکی سووکەڵە بۆ جویکردنەوەی بەشێک لە هۆدە.

**پارچ** / pārč، ـها:/اسم. پارچ؛ تۆنگ؛ تۆنگە؛ سوراحی؛ گۆزەڵە؛ بەقۆ؛ بەقۆک؛ لوولێنەی ئاوخۆرە.

**پارچه** / pārče، ـها:/اسم. پارچە: ١. کووتاڵ؛ کاڵا؛ قوماش ‹پارچەی پیراهن: پارچەی کراس› ٢. [مجازی] بەش؛ لەت؛ تیکە؛ پارچە؛ پاژە ‹یک‌پارچە: یەک‌پارچە› ٣. قەوارە؛ بۆ ئەژماردنی هەندێ شتان (وەک زەوین و ماڵ یان ئاوایی) ‹او در کرمانشاه ده پارچه آبادی داشت: لە کرماشاندا دە قەوارە ئابادی هەبوو›.

**پارچه‌ای** / pārče'î/: صفت. پارچەیی؛ کووتاڵی؛ پەڕۆینە ‹عروسک پارچه‌ای: وەویلکەی پارچەیی›.

**پارچه‌بافی** / pārčebāf î/:/اسم. پارچەچنی؛ کووتاڵ‌چنی: ١. کاری چنینی پارچە ‹او سال‌ها پارچه‌بافی می‌کرد: چەند ساڵان پارچەچنی دەکرد› ٢. /ـها/ کارگای چنینی پارچە ‹او در پارچه‌بافی کار می‌کند: لە پارچەچنیدا کار دەکا›.

**پارچه‌فروش** / pārčefurûš، ـها؛ ـان/:/اسم. پارچەفرۆش؛ قوماش‌فرۆش؛ کووتاڵ فرۆش؛ کەسێک کە کاری فرۆشتنی پارچەیە.

**پارچه‌فروشی** / pārčefurûšî، ـها:/اسم. پارچەفرۆشی؛ کووتاڵ‌فرۆشی؛ کووتاڵ ورەشی؛ قروماشی: ١. /ـها/ فرۆشگەی پارچە ٢. پیشە یان کاری پارچەفرۆش * بزازی

**پارچه‌نویسی** / pārčenevîsî، ـها:/اسم. پارچەنووسی؛ کاری نووسینی (ئاگاداری و پیرۆزبایی و ...) لە سەر پارچە.

**پاردم** / pārdom، ـها:/اسم. [ادبی] پاڵوو؛ پاڵۆ؛ پاڵدوو؛ پاردوو؛ قۆیشە؛ قوشقون؛ ئەو ئاڵقە یا ئەو گوریسە کە بن کلکی یەکسم دەگرێ.

**پاردم‌ساییده** / pārdomsāyîde، ـها/: صفت. [مجازی] بێ‌شەرم؛ بێ‌حەشر و نەشر؛ بێ‌حەیا؛ بێ‌عار ‹چند تا از آن آدمهای پاردم‌ساییده را دنبالش راه انداخته بود: چەن کەس لەو بێ‌شەرمانەی خستبووە شوێنی خۆی›.

**پارس** / pārs، ـها:/اسم. ١. فارس؛ هۆزێکی کەونارای ئاریایی کە لە باشووری ئێراندا دەژین ٢. گەفە؛ گەفەـگەف؛ حەپە؛ حەپەـحەپ؛ حەو؛ حەوـحەو؛ حەف؛ حەفار؛ حەوتە؛ وەڕە؛ ڕەوە؛ وەڕەـوەڕ؛ سەگڕەو؛ سەگوەڕ؛ وەپ؛ پاس؛ دەنگی سەگ.

**پارسا** / pārsā ، ـیان/: صفت. پارسا؛ دژکام؛ تەرکەدنیا؛ پارێزکار؛ خۆپارێز؛ لەخواترس.

**پارسائی** / pārsā'î/ ☜ **پارسایی**

**پارسال**[1] / pārsāl/:/اسم. پار؛ پارەکە؛ ساڵی پێشوو؛ ساڵێ لەمەوبەر؛ ساڵی ڕابردوو ‹تا پارسال در مهاباد بودیم: تا پارەکە لە مەهاباد بووین›.

**پارسال**[2]: قید. پارەکە؛ پار؛ لە پارەکەدا؛ لەساڵی پێشوودا ‹پارسال به سارال رفتیم: پارەکە چووین بۆ ساراڵ›.

**پارسایانه**[1] / pārsāyāne/: صفت. پارێزگارانە؛ پەرزایانە؛ بە پارێزگاریەوە ‹زندگی پارسایانه: ژینی پارێزگارانە›.

**پارسایانه**[2]: قید. پەرزایانە؛ بەپارێزگاریەوە ‹پارسایانه زندگی می‌کرد: پەرزایانە دەژیا›.

**پارسایی** / pārsāyî، ـها:/اسم. [ادبی] پارێزگاری؛ پەرزایی؛ کار یان ڕەوتی دووری گرتن لە کاری نالەبار و نەشیاو: **پارسائی**

**پارسک** / pārsek/: [فرانسوی]/اسم. پارسێک؛ یەکەیەک بۆ مەوداگەلی کیانی بەرانبەر بە $3{,}09\times10^{13}$ کیلۆمیتر یا ٣،٢٦ ساڵی

نووری.

**پارسنگ** / pārsang، ـها/:/اسم. پارسەنگ؛ سەنگترازوو؛ سەنگ قووە؛ کۆمەگی بەردی تەرازووی سۆک.

**پارسه** / pārse/:/اسم. [ادبی] گەدایی؛ سواڵ؛ پارسە؛ دەرووزە؛ کار یان ڕەوتی دەست داکێشان لە خەڵک و داوای پارە و یارمەتی کردن.

**پارسی** / pārsî، ـها؛ ـان/:/اسم ١. فارسی؛ پارسی ٢. زەردەشتی (بەتایبەت دانیشتووی هیند).

**پارشمن** / pāršman، ـها/: [؟]/اسم. پێستی خۆشەکراوی پەز و بزن کە لە ڕابردوودا بە جێی کاغەز، بۆ نووسین کەڵکی لێ وەردەگیرا.

**پارک** / pārk، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پارک: ١. سەیرانگا؛ سەیرانگەها؛ گەڕانگە؛ جێگایەکی گشتی بە شێوەی باخێکی گەورە و پڕ لە گوڵ و گیا و ئامرازی کایە کردن بۆ منداڵان ‹دیروز بچەها را بردم پارک: دوێنێ منداڵەکانم بردن بۆ پارک› ٢. ڕاوەستانی ماشین ‹یک ماشین آنجا پارک شده بود: گەڕۆکێک لەوێدا پارک کرابوو› ٣. [نظامی] جێیەک کە بڕێ تۆپ، تانک یان گەڕۆکی چەکداری لێ دابین کرابێتن ‹پارک توپخانه: پارکی تۆپخانە›.

▣ **پارک بچه** ☜ **مانک**

**پارک جنگلی**: پارکی جەنگەڵی؛ سەیرانگای لێڕەواری.

**پارک عمومی**: سەیرانگای گشتی؛ پارکی گشتی.

**پارک ملی**: سەیرانگای نەتەوەیی؛ پارکی نەتەوەیی؛ پارکی هەڵگرتن و پاراستنی گژ و گیا یان گیانلەبەرانی نایاب یان ئاقاری سروشتی کە دەوڵەت چاوەدێری لێدەکا.

**پارک وحش**: پارکی ڕاوران؛ دەڤەرێکی پارێزراو بۆ پارازتن و ڕاگرتنی گیانلەبەرانی وەحشی لە ناوچەیەکی خۆڕسکدا، بە ئازادی.

▣ **پارک کردن**: پارککردن؛ ڕاوەستاندن؛ وەستاندن؛ وێسانن؛ ڕاگرتن؛ مدرنەی؛ دانان و زۆرتر بەجێهێشتنی کەرەسەی هاتوچوو لە شوێنێک. هەروەها: **پارک شدن**

**پارکابی** / pārekābî، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. [قدیمی] شاگرد؛ شاگرد شۆفێر.

**پارکبازار** / pārkbāzār، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. پارکبازاڕ؛ شوێنێک کە بریەتیە لە چەند فرۆشگای بە پارکینگەوە.

**پارکت** / pārket، ـها/: [فرانسوی]/اسم. چێو فەرش؛ چۆ فەرش؛ پارچەی چێوی لووسکراو و دەپاڵ یەک چنراو بۆ فەرش کردنی خانوو.

**پارکوی** / pārkvey/: [فرانسوی] ☜ **باغراه**

**پارکینگ** / pārkîng، ـها/: [انگلیسی]/اسم. پارکینگ؛ گاراج؛ شوێنی ڕاگرتنی ماشین.

**پارگی** / pāregî/:/اسم. دڕاوی؛ دڕیاگی؛ دڕیاوی؛ جیکەدراو؛ شڕ و لەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لێجیا بوونەوەی پرژەی لە تان و پۆ یان هەودای شتێک ‹پارگی ناشی از ضربەی چاقو: دڕاوی بەهۆی لێدانی چەقۆوە›.

**پارگین** / pārgîn، ـها/:/اسم. خەرەند؛ بەلۆعە؛ فازلاو؛ شوێنی دەرچوونی پیسایی و ئاوی دوای شۆردن.

**پارلمان** / pārlemān، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پەرلەمان؛ ئەنجومەن؛ کۆڕی نوێنەران بۆ دەستوور دانان.

**پارلمانتاریسم**/ pārlemāntārîsm/: [فرانسوی] /اسم. ١. دەزگای سیاسی خاوەن پەرلەمان

یان پەرلەمانگەلی دەستوور دانان ٢. باوڕ بە هەبوونی هێز و دەسەلات لە لایەن دەزگای پەرلەمانیەوە.

**پارلمانی** / pārlemānî/: [فرانسوی] *صفت.* پەرلەمانی؛ پارلمانی ‹انتخابات پارلمانی: هەڵبژاردنی پەرلەمانی›.

**پارنج** / pāranc/: *اسم.* قەدەمانە؛ کالەدرانە؛ پارەیەک کە بۆ هاتنی کەسێ و جێبەجێ کردنی کارێک پێی دەدرێ (بەتایبەت بۆ بژیشک دەگوترێ).

**پارو** / pārû، ـها/: *اسم.* پارۆ؛ پارووی؛ پالێ؛ ئاوژەن؛ ویە؛ هوە؛ هووە؛ هویی؛ چەپە؛ سەوڵ؛ سەلپ؛ مەژرفە؛ شەلی؛ بێلی دارین؛ بێلەدارینە.

▣ **پارو زدن:** پارۆ لێدان؛ قەفاندن؛ سەلپاندن؛ سەوڵ لێدان ‹من خسته شدم، تو هم کمی پارو بزن: من لە باڵ کەوتم، تۆیش هێندێک پارو لبدە›.

**پاروکردن:** مالین؛ پارۆ کردن؛ سەوڵ کردن؛ بێرک کرن؛ شتێک (بەتایبەت بەفر) بە پارۆ ڕامالین ‹آمد و برفها را پارو کرد: هات و بەفرەکانی مالی›.

**پارونی** / pārû'î/ ☜ **پارویی**

**پاروزن** / pārûzan، ـها، ـان/: *اسم.* پارۆ لێدەر؛ سەولوان؛ شەلیڤان؛ سەوڵزەن ‹برخی کشتیهای قدیمی سه ردیف پاروزن داشتند: هەندێ لە گەمیەگەلی پێشوو سێ ڕیز پارولێدەریان هەبوو›.

**پاروزنی** / pārûzanî/: *اسم.* پارۆلێدەری؛ شەلیڤانی؛ کار یان ڕەوتی ڕاژاندنی بەردەوامی پارۆ لە ئاودا بۆ بەڕێوە بردنی کەرەسەی هاتوچۆکەری سەر ئاو.

**پارویی** / pārûyî/: *صفت.* پارۆیی: ١. پارۆدار؛ ویەدار ٢. وەکوو پارۆ ❋ **پاروئی**

**پارە**[1] / pāre، ـها/: *اسم.* کوت؛ کت؛ لەت؛ پارچە؛ کەر؛ کەرک؛ دادڕ؛ کەری؛ پاژ؛ کگەرت؛ فەرژ؛ قراش؛ شڕ؛ پارە؛ قەل؛ تیقەل؛ تیکە؛ دەڕسە؛ تلیشە؛ چڕیاو؛ بڕ و بەشێک لە کۆمەڵێ یان شتێک ‹شکست و هر پاره‌اش جایی افتاد: شکا و هەر کوتێکی کەوتە جێیەک›.

**پارە**[2]: *صفت.* دڕاو؛ دریاو؛ دریاگ؛ دریا؛ دادڕاو؛ شیپاڵ؛ شیتاڵ؛ هەلدڕاو؛ هۆردڕیا؛ چڕیاو؛ چڕیاگ؛ چڕاو؛ ئالنگ.

▣ **پارە شدن:** هەلدڕان؛ دڕان؛ دادڕان؛ دادڕیان؛ فەرزین؛ تلیشیان؛ پڕان؛ لێک بوونەوە؛ شەق بردن؛ لەت بوون؛ گەزحان؛ پارچەبوون؛ دڕیەی ‹پیراهنم پاره شد: کراسەکەم دڕا›.

**پارە کردن:** دڕاندن؛ ڕنای؛ دڕنەی؛ چڕاندن؛ دادڕین؛ هەلدڕین؛ هۆر دڕنەی؛ لەتکردن.

**پارە ـ**[3]: *پیشواژه.* لەتە؛ کوتە؛ پارە؛ بەشێک لە شتێک ‹پاره خط؛ پاره آجر: لەتەدێڕ؛ کوتەئاجۆر›.

**ـ پارە**[4]: *پیواژه.* ـ پارە؛ ـ لەتە؛ ـ کوتە: ١. شکاو؛ وردبووگ؛ ڕزاو؛ پواو؛ مڕیا ‹آجرپاره؛ آهن‌پاره: ئاجۆرپارە؛ ئاسنەلەتە› ٢. بەش یان جۆرێکی بچووک لە شتێک ‹کاغذپاره: کاغەزەلەتە›.

**پارەآجر** / pāre'ācor/ ☜ **آجرپارە**

**پارەای**[1] / pāre'î/: *صفت.* هێندێ؛ هەندێ؛ هێندێک؛ بڕێک؛ بڕێو ‹پاره‌ای وسایل درآنجا گذاشته بودم: هێندێ شتومەکم لەوێ دانابوو›.

**پارەای**[2]: ضمیر. هێندێ؛ هەندێ؛ هێندێک؛ هەندێک؛ بڕێک؛ بڕێو ‹پاره‌ای خواستند بروند و پاره‌ای ماندند: هێندێ ویستیان بڕۆن و هێندێک مانەوە›.

**پارە–پارە** / pārepāre، ـها/: *صفت.* بەش‌بەش؛ لەت‌لەت؛ کوت‌کوت؛

لەت-کوت؛ قەڵ-قەڵ؛ گنجڕ؛ ونجڕ؛ شڕ و شڕۆڵ؛ پریش-پریش؛ پارچە-پارچە؛ شرودڕ؛ قڕاش-قڕاش؛ لەتار؛ لەتار-لەتار؛ ڕیزە-ڕیزە؛ شەقار؛ شەقار وەقار؛ شڕ و شیتاڵ؛ بە دڕاوی زۆرەوە.

**پارە-پورە** / pārepûre، ـها/: صفت. [گفتاری] لەتوپەت؛ کوتولەت؛ شڕ و دڕ؛ شڕ و وڕ؛ لەتوکوت؛ شەڵوپەت؛ کەڵوکۆم؛ ونجڕ-ونجڕ؛ پچڕ-پچڕ.

**پارەخط** / pārexat، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. لەتەخەت؛ کوتەخەت؛ هێڵێ کە سەرەتا و بنەتای دیار بێ.

**پارەدوز** / pāredûz، ـها؛ ـان/: اسم. [ادبی] پینەدۆز؛ پینەچی؛ شرەوراز.

**پارەوقت** / pārevaqt/: [فارسی/ عربی] صفت. بەشێک لە کات یان ڕۆژەکانی کارکردن، نەک هەمووی.

**پارین‌زیوی** / pârînzîvî/: اسم. کۆنترین دەورانی زەویناسی کە تێیدا ژیان لە ئاوەوە دەستی پێکردووە.

**پارینەسنگی** / pārînesangî/: اسم. پالئۆلیتیک؛ ڕۆژگاری کەڤنیبەری: **دیرینەسنگی**

**پازن** / pāzan، ـها/: اسم. نێرۆ؛ نێرووە؛ نێری؛ کەڵ؛ بزنەکێوی؛ بزنەکێفی؛ کەڵەکێوی.

**پازند** / pāzand/: اسم. پازەند؛ زمانی پالەوی بێهوزوارش (پیتی نیشانەکراو بۆ نووسین) کە لە چەرخی ٢ و ٣ کۆچی مانگی و لەژێر کارتێکەری زمانی باوی فارسی ئەو سەردەمەدا ڕەخسا و هاتە سەر زارەوە.

**پاس** / pās/: اسم ١. / ـها/ کێشووی؛ کێشک ‹هر دو ساعت یک نفر در آنجا پاس می‌داد: هەر دوو سەعات کەسێک لەوێدا کێشکی دەدا› ٢. واسە؛ پاس؛ ئێشک؛ کێشکچی؛ نواوان ‹پاس خیابان مولوی: واسەی شەقامی مەولەوی› ٣. چاوەدێری؛ چاودێری ‹پاس داشتن: چاوەدێری کردن› ٤. پاژ؛ بەش ‹پاسی از شب: بەشێک لە شەو› ٥. [فرانسوی] [ورزش] پاس؛ کاری ناردن و ڕەوانەکردنی شتێکی وەک تۆپ بەرەو گەمیاریتر.

▣ **پاس شب:** ئێشک شەو؛ نگابانی شەو؛ کێشکی شەو.

**بە پاس:** لە هەمبەر؛ بۆ سپاسی؛ بۆ ڕێز گرتن ‹به پاس کمکهای برادرانەی ایشان: لە هەمبەر یارمەتی برایانەی ئەوانەوە›.

▣ **پاس دادن:** ١. کێشکدان؛ چاوەدێری کردن ٢. پاس دان؛ خستنی تۆپ بۆ یارێک لە تۆپێندا ‹پاس داد به یار شماره ١٢: پاسی دا بە یاری ژمارەی ١٢› ٣. [مجازی] پاس دان؛ بانوخوار پێکردن ‹مرا از این اتاق به آن اتاق پاس می‌دادند: لەم ژوور بۆ ئەو ژوور پاسیان دەدام›.

**پاس داشتن:** بەرز ڕاگرتن؛ ڕێزگرتن ‹حرمت او را پاس می‌داشت: قەدری بەرز ڕانەگرت›.

**پاس کردن:** دەرچوون ‹امتحان شیمی را نتوانستم پاس کنم: نەمتوانی لە ئەزموونی کیمیادا دەرچم›.

**پاسار** / pāsār/: اسم. شیپان؛ شیپانە؛ لاشیپان؛ تەکیەی دەرگا. بەرانبەر: **لَنتو**

**پاساژ** / pāsāj، ـها/: [فرانسوی] اسم. شاردووکان؛ پارساژ؛ پاساج؛ خانووبەرەیەکی بە شێوەی دالان بە دووکانگەلێک تێیدا ‹در آن پاساژ مغازه دارد: لەو شاردووکانەدا دووکانی هەیە›.

**پاسبان** / pās(e)bān، ـها؛ ـان/: اسم. ١. [نامتداول] ئێشکگر؛ کێشکچی؛ پاسەوان؛ نواوان؛ ئاژان؛ زیرەڤان؛ زیرەڤان؛ پۆلیس؛ قۆڵچی؛ پاسدار؛ کۆت؛ ئاردەڵ ٢. [ادبی]

چاودێر؛ ئەوی ئاگاداری‌کردن لە شتێکی وەئەستۆیە ‹دولت پاسبان جان و مال مردم است: دەوڵەت چاودێری گیان و مالی خەڵکە›.

**پاسبانی**[1] / pās(e)bānî/: اسم. ئێشک‌گری؛ نواوانی؛ پاسەوانی؛ پاسداری: ١. کاری پاسەوان ٢. /ادبی/ پاسەوانی؛ نگابانی؛ چاوەدێری ‹شب تا صبح بە پاسبانی گلە پرداخت: شەو تا بەیانی پاسەوانی ڕانەکەی کرد›.

**پاسبانی**[2]: صفت. ئێشک‌گری؛ نواوانی؛ پاسەوانی؛ پێوەندیدار بە پاسەوانەوە ‹لباس پاسبانی: پۆشەنی پاسەوانی›.

**پاس‌بخش** / pāsbaxš، ـها/: اسم. سەرپاسەوان؛ ئەوەی چاوەدێری بە سەر کاری پاسەوانان و مەزرینگەی پاسەوانیەوە دەکا.

**پاسپار** / pāspār/: صفت. بەرپێ؛ ژێرپێ؛ ژێرپا.

**پاسپورت** / pāsport، ـها/: [فرانسوی] اسم. پاس؛ پەساپۆرت؛ بەراییسنامە بۆ چوونە هەندەرانەوە.

**پاستل** / pāstel، ـها/: [فرانسوی از ایتالیایی] اسم. پاستیل: ١. جۆرێک گەچی هەمەڕەنگە بۆ نەقاشی و ڕەسم‌کێشان ٢. جۆرێ شیرینیە وەک ڕاحەت، بەلام هێندێک سفت‌تر.

**پاستوریزاسیون** / pāstorîzās(i)yon/: [فرانسوی] اسم. پاستۆریزاسیۆن؛ کار یان ڕەوتی پاستۆریزەکردن؛ دانانی خواردەمەنی لە تینێکی تایبەت و بە ماوەیەکی دیاریکراو، بۆ سڕین و کوشتنی باکتریا نەخۆش‌خەرەکان.

**پاستوریزه** / pāstorîze، ـها/: [فرانسوی] صفت. پاستۆریزە؛ تایبەتمەندی ماکێکی خوراکی کە پاستۆریزاسیون کرابێ ‹شیر پاستوریزه: شیری پاستوریزه›.

**پاسخ** / pāsox، ـها/: اسم. وەرام؛ ولام؛ وەلام؛ ولام؛ پەرسڤ؛ پاگۆ؛ واوێژ؛ جواو؛ جواب؛ جاب ‹ناطق در پاسخ خبرنگاران گفت... : وێژەر لە وەرامی هەواڵدەراندا گوتی...›.

**پاسخدهی** / pāsoxdehî/ ☜ **پاسخگویی**

**پاسخگو** / pāsoxgû، ـیان/: اسم ١. وەلامدەر؛ وەرامدەر؛ جواودەر؛ جوابدەر؛ پەرسڤدەر؛ ئەوەی وەرامی پرسیارگەل دەداتەوە ‹مسئول اداره پاسخگوی پرسشهای شماست: بەرپرسی مەزرینگە وەلامدەری پرسیارەکانتانە› ٢. بەرپرس؛ وەرپەرس ‹چرا کسی خود را پاسخگو نمی‌داند: بۆچی کەس خۆی بە بەرپرس نازانێ›.

**پاسخگویی** / pāsoxgûyî/: اسم. ١. وەلامدەری؛ کار یان ڕەوتی جواو دانەوە؛ وەلام دانەوە؛ وەرام دانەوە ‹آنگاه آزاد بە پاسخگویی پرداخت: پاشان ئازاد دەستی کرد بە وەلام دانەوە› ٢. بەرپرسایەتی؛ دۆخ یان چۆنایەتی بەرپرس بوون ‹پاسخگویی بە عهدە شماست: بەرپرسایەتی بە ئەستۆی ئێوەیە› * **پاسخدهی**

**پاسدار** / pāsdār، ـها؛ ـان/: اسم. نواوان؛ پارێزەر؛ پاسدەر؛ ئێشک‌گر؛ نۆبەچی؛ کێشکچی؛ نۆتر؛ نۆترڤان؛ نۆگەچی؛ نۆبەدار ‹پاسدار امنیت کشور: پارێزەری هێمنایەتی وڵات›.

▣ **پاسدار صلح**: ئاشتیوان؛ پارێزەری ئاشتی: ١. هێزێ کە پاراستنی ئاشتی و بەرگری لە درێژەدان بە شەڕ و شۆڕی بە ئەستۆیە ٢. هەر یەکە لە سەربازانی ئەو هێزە.

**پاسدارخانه** / pāsdārxāne، ـها/: اسم. پاسدەرگە؛ پاسدارخانە؛ قشڵە؛ ژوورێ کە پاسدەرانی تێدا دەحەسێنەوە.

**پاسداری** / pāsdārî/: اسم ١. /ـها/ چاودێری؛ چاوەدێری؛ نگابانی ‹مردم پاسداری از شهر را

به عهده گرفتند: خەڵکی چاوەدێری لە شاریان وە ئەستۆگرت› ٢. ئێشکگری؛ پاسەوانی؛ پاسداری؛ کاری پاسداری ‹از حقوق پاسداری استفاده می‌کند: لە مووچەی پاسەوانی کەڵک وەر دەگرێ›.

**پاسکال** / pāskāl/: [انگلیسی]/اسم. پاسکاڵ: ١. یەکەی پێوانەی تەوژم، بەرامبەر بە تەوژمی یەک نیوتون بە سەر میترێکی چوارگۆشدا ٢. یەکێک لە زمانگەلی بەرنامەنووسی کامپیوتەر.

**پاسگاه** / pāsgāh، ـها/: اسم. بنکە؛ شوێنێ کە تاقمێکی کەم لە هێزی پۆلیس یان ئەرتەشی تێدا جێگر دەبن ‹پاسگاه پلیس: بنکەی پولیس›.

**پاسنگ** / pāsang، ـها/: اسم. باریکە پەراوێزی هێندێک زۆپایی پای دیوار یان دەوری ستوون.

**پاسور** / pāsûr/: [؟]/اسم. پاسوور؛ جۆرێک یاری کە بە پەڕە دەکرێ ‹شبها دور هم می‌نشستند و پاسور بازی می‌کردند: شەوان لە دەوری یەکدا دادەنیشتن و پاسووریان دەکرد›.

**پاسوز** / pāsûz/: صفت. [کنایی، گفتاری] پاسۆچ؛ پاسووز؛ پێسووت؛ بێبەش و دابڕاو لە خۆشیگەلی ژیان بە هۆی ئاگاداری و چاوەدێری لە کەسێک یان چاوەڕوانی کردنی کەسێک ‹پس از مرگ شوهرش خود را پاسوز بچەهایش کرد و شوهر نکرد: دوای مردنی شووەکەی خۆی کردە پاسوچی منداڵەکانی و مێردی نەکرد›.

**پاسیار** / pāsyār، ـها؛ ـان/: اسم. [نامتداول] زەبلووت؛ جووتەخاڵ؛ سەرهەنگی شارەوانی.

**پاسیفلورین** / pāsîfelorîn/: [فرانسوی]/اسم. گل ساعتی ☜ **گل**

**پاسیفیسم** / pāsîfîsm/: [؟]/اسم. پاسیفیزم؛ باوڕ بەوە کە ئاشتی جیهانی دەبێ لە ڕێگەی هاوکاری و هاوسەنگیەوە بپارێزرێ.

**پاسیو** / pās(i)yo، ـها/: [فرانسوی از اسپانیایی] /اسم. ڕۆچنە؛ نوورگیر؛ ڕۆژنە.

**ـ پاش** / pāš/: پیواژە. ـپاش؛ ـپژێن؛ ـپرژێن؛ ـرشێن ‹آبپاش: ئاوپاش›.

**پاشا** / pāšā، ـها؛ ـیان/: اسم. پاشا؛ نازناوی پایەبەرزانی دەوڵەتی عوسمانی ‹محمود پاشا: مەحموودپاشا›.

**پاشام** / pāšām/: اسم. [کالبدشناسی] پەردە؛ توێ؛ تۆ؛ لا.

▣ **پاشام شکم**: پەردەی زگ؛ پەردەی بەینی سی و گەدە.

**پاشام مغز**: پەردەی مێشک؛ هەرکام لە سێپەردەی دەوری مێشک.

**پاشاندن** / pāšāndan/: مصدر. متعدی. //**پاشاندی**: هەڵتوەشاند؛ **می‌پاشانی**: هەڵدەوەشێنی؛ **بپاشان**: هەڵوەشێنە // ١. هەڵوەشاندن؛ هەڵوەشاندنەوە؛ هەڵشێواندن؛ لێک پاشین؛ تێکدان؛ هۆرشێونەی ‹آن گروه را از هم پاشاندند: ئەو تاقمەیان لێک هەڵوەشاند› ٢. پژاندن؛ ڕژاندن؛ پژگنەی؛ پژگنای ‹زد روی دستم همه را پاشاند: دای لە دەستم و هەمووی پژاند› ❋ **پاشانیدن**. هەروەها: **پاشاندنی**

■ صفت فاعلی: **پاشاننده** (هەڵوەشێنەر)/ صفت مفعولی: **پاشانده** (هەڵوەشێنراو)/ مصدر منفی: **نَپاشاندن** (هەڵنەوەشاندن)

**پاشانیدن** / pāšānîdan/ ☜ **پاشاندن**

**پاشنده**[1] / pāšande، ـها/: اسم. پژانە؛ پژێنە.

**پاشنه** / pāšne، ـها/: اسم. پاژنە؛ پاشنی؛ پەچنی؛ پانیە؛ جبک؛ پەهنی؛ پێن؛ پاژنێ؛ پاژنۆ: ١. لەپان؛ بەشی پاشینی پا ‹پاشنەی پا: پاژنەی پێ› ٢. ئێسکێکی چوار سووچی نارێک لە ژێر پادا کە قورسایی لەش

هەڵدەگرێ ‹استخوان پاشنه: ئێسقانی پاژنە› ٣. بەشێک لە پێڵاو یان گۆرەوێ کە پاژنەی پێی تێیدا جێدەگرێ ‹پاشنەی جوراب: پاژنەی گۆرەوێ› ٤. ناڵچەی پێڵاو ‹کفش پاشنه بلند: پێڵاوی پاژنەبەرز› ٥. گێجەنە؛ گێجەنێ؛ گێژەنە؛ درسمە؛ سکپ ‹پاشنەی در: گێجەنەی دەرگا› ٦. *[صنعت]* خولگە؛ چەمەر ٧. *[نظامی]* پەلەپیتکە؛ ماشە.

▣ **پاشنه بلند:** پاژنە بەرز؛ پاژنە بڵیند؛ ناڵچە بەرز. هەروەها: **پاشنه کوتاه؛ پاشنەدار؛ بی‌پاشنه**

▣ **پاشنەی در را از جا درآوردن:** *[کنایی]* دەرگا لە گێجەنە دەرهێنان: ١. بە پەلەپەل و بەردەوام زەنگ لێدان یان دەرگا کوتان ‹چه خبر است، پاشنەی در را از جا دراوردی: چ خەبەرە، دەرکاکەت لە گێجەنە دەرهێنا› ٢. زۆر سوور بوون لە سەر شتێک و لە سەریەک بۆ بەدەست هێنانی دەرگا کوتان ‹انگار خواستگارهایش پاشنەی در را از جا دراوردەاند: تۆ دەڵێی داواکارەکانی دەرکاکەیان لە گێجەنە دەرهێناوە›.

**پاشنەی دهان را کشیدن:** *[مجازی]* دەم هەڵماڵین؛ دەم وەشاندن؛ دەمدان؛ زیب دەم کێشان؛ دەڤ چێری و دەڤ سڤکی کرن ‹پاشنەی دهانش را کشید و هرچه از دهنش در آمد، گفت: دەمی هەڵماڵی و هەرچی لە دەمی‌دەرهات، وتی›.

**پاشنه را ور کشیدن:** *[کنایی]* چاک وەلادا دان؛ قۆڵ لێ‌هەڵکردن؛ قۆڵ لێ‌هەڵماڵین؛ چۆڵێ/ قولێ هۆرکەردەی؛ خۆ تەیارکردن ‹پاشنه را ور بکش و راه بیفت: چاکی لی وەلادە و ڕێ‌کەوە›.

**پاشنەی کسی را کشیدن:** *[کنایی]* دنەی کەسێک دان؛ کەسێک هەڵخڕاندن؛ کەسێک هاندان؛ چوکڵەختێی کەسێک دان ‹علی هم پاشنه‌اش را می‌کشید و تشویقش می‌کرد: عەلیش دنەی ئەدا و هەڵی‌دەخڕاند›.

**پاشنەکش** / pāšnekeš، ـها/: *اسم.* پاژنەهەڵکێش؛ پانیەکێش؛ کەرەتە.

**پاشوره** / pāšûre/: *اسم.* ١. پەخ؛ گێڕ؛ کەل ٢. *ـها/ [گفتاری]* پاشۆرە؛ پاشۆر؛ پێ‌شۆرە.

▣ **پاشورە کردن:** ١. پَخ کردن ☜ **پَخ** ٢. پاشۆرە کردن.

**پاشویه** / pāšûye/: *اسم* ١. پاشۆرە؛ ئاوی (زۆرتر سارد) بۆ شۆردنی پای نەخۆش ٢. *ـها/* پاشاراو؛ جۆگەی باریکی دەوری حەوزی * **پاشوره** *[گفتاری]*

▣ **پاشویە کردن:** پاشۆرەکردن؛ شۆردنی پای نەخۆشی یاودار بۆ بڕینی یاوەکەی.

**ـ پاشی** / pāšî/: *پیواژه.* ـ پژێن؛ـ پرژێن؛ ـ پاشی؛ پاشین ‹آب‌پاشی: ئاوپژێن›.

**پاشیب** / pāšîb/: *اسم.* پلەیەک کە بۆ ژێر زەوی بڕوا.

**پاشیدگی** / pāšîdegî، ـها/: *اسم.* ١. پرژ و بڵاوی؛ پژاوی؛ پرژاوی؛ پژگیایی ٢. هەڵوەشاوی؛ هەڵشێواوی؛ چۆنیەتی هەڵشێوان و هەڵوەشان.

**پاشیدن** / pāšîdan/: *مصدر. متعدی. لازم.* //**پاشیدی:** پژاندت؛ **می‌پاشی:** دەپژێنی؛ **بپاش:** بپژێنە// ☐*متعدی.* ١. پژاندن؛ پاشین؛ پاشەی؛ پاشای؛ پژگنەی؛ بڵاوە پێ‌کردنی هەر شتێک ☐*لازم.* ٢. پژان؛ پاشین؛ پاشیەی؛ پژگیەی؛ بڵاوە بوونی دانە و ڕێزەگەل یا تنۆکگەلی شتێک. هەروەها: **پاشیدنی**

■ صفت فاعلی: **پاشنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **پاشیده** (پژاو)/ مصدر منفی: **نَپاشیدن** (نەپژاندن)

**پاغره** / pāqore/ ☜ **داءالفیل**

**پافشاری** / pāfešārî، ـھا/:اسم. پێداگری؛ پاداگری؛ پێ‌كۆڵی؛ میچ؛ میچڵە؛ هەتەزی؛ پڕژلی؛ چوور؛ چیڕی‌وگیڕی؛ كار یان ڕەوتی پێ‌بەگەزدان؛ لاق چەقاندن؛ پڵ چەقاندن؛ سوور بوون؛ ڕك‌سوور بوون؛ گیرە و پێ چەقاندن.

**پافنگ** / pāfang/:اسم.[نظامی] پافەنگ؛ ڕاگرتنی چەك بە دەستی ڕاست لە پەنای پای ڕاستەوە، سەر بەرەژوور.

**پاق‌وپوق** / pāq(q)-o-pûq/: صوت.[گفتاری] قوڵتەقوڵت؛ بڵقەبڵق؛ قڵتەقڵت؛ قوڵپەقوڵپ؛ دەنگی كوڵانی تەڕاوان.

**پاك**[1] / pāk/: صفت. پاك: ١. خاوێن؛ بێ‌خەوش؛ پوختە؛ پاكژ؛ پاقژ؛ پوار؛ پا؛ هیلاو؛ بژوون؛ تەمیس ٢.[مجازی] درووسكار؛ بێ‌عەیب؛ دەسپاك؛ جەمتانە ‹آدم پاك: مرۆی پاك› ٣. ☜ عید پاك، **عید**

⊡ **پاك شدن**: پاكەوە بوون؛ پوختەوە بیەی: ١. تەمیس بوون؛ پاكژ بوونەوە؛ نەمانی پیسی ٢. پاكەوە بوونی نووسراوە یان وێنە. هەروەها: **پاك بودن؛ پاك‌كردن**

**پاك**[2]: قید.[گفتاری] بەیەكجاری؛ بەتەواوی؛ بەگشتی؛ پاك؛ بەتەمامی؛ تەمام؛ یەكەشە؛ یەكسەرە ‹پاك دیوانە شدە است: بەیەكجاری شێت بووە›.

**پاك‌ـ**[3]: پیشوازە. پاكـ: ١. پاكژ؛ خاوێن و ڕێك‌وپێك ‹پاك‌نویس: پاك‌نووس› ٢. ـپاك؛ بێ‌گەرد و خەوش ‹پاك‌دامن: داوێن‌پاك›.

**پاكات** / pākāt/: (!) [بە قاعدەی عربی] جمعِ ☜ **پاكَت**

**پاكار** / pākār، ـھا/:اسم. پاكار؛ دەسیار؛ دەستیار؛ پێشكار؛ بەردەست؛ وەردەس؛ گزیر؛ هەیتە؛ شاگرد وەستا.

**پاكباختە** / pākbāxte، ـھا؛ ـگان/:اسم ١. كش‌بوو؛ قات‌بوو؛ كەسێ كە هەموو پارەی خۆی دۆڕاندووە ٢. ماڵ‌وێران؛ كەسێ كە هەموو شتێكی لە دەست داوە.

**پاكباز** / pākbāz، ـان/: صفت. ١. دروستكار؛ درووسكار؛ ئاكارچاك؛ دەسپاك ٢. دلۆڤان؛ زۆر بەخشندە و لەخۆ بوردوو.

**پاكبازی** / pākbāzî/:اسم. ١. دروستكاری؛ دەسپاكی ٢. دلۆڤانی.

**پاك‌بین** / pākbîn/: صفت.[مجازی] ١. گەشبین؛ ڕوون‌بین ٢. چاوپاك. هەروەها: **پاكدل؛ پاك‌سرشت؛ پاك‌سیرت؛ پاك‌نهاد**

**پاكت** / pākat/: [فرانسوی]/اسم./ـھا؛ پاكات/ پاكەت؛ زەرف؛ دەفری‌نامە.

⧈ **پاكت پستی**: پاكەتی پۆست؛ پاكەتێ كە نامەی تێ‌دەنێن.

**پاكتی** / pākatî/: [فرانسوی] صفت. پاكەتی: ١. لە بیچمی پاكەت ‹جیب پاكتی: گیرفانی پاكەتی› ٢. بە پاكەت یان لە نێو پاكەتدا ‹شیر پاكتی: شیری پاكەتی›.

**پاكدامن** / pākdāman/: صفت.[مجازی] هێمۆ؛ داوێن‌پاك؛ پاكداوێن؛ دوور لە گوناح ‹زن پاكدامن: ژنی داوێن‌پاك›.

**پاكدامنی** / pākdāmanî/:اسم.[مجازی] هێمۆیی؛ داوێنپاكی؛ پاكداوێنی؛ خەنەكچانی؛ دۆخ یان چۆنایەتی بێ‌گوناحی و ئاكارچاكی.

**پاكدوزی** / pākdûzî، ـھا/:اسم.[خیاطی] كار یان ڕەوتی لێوارەگرتن؛ ئەو جۆرە دوورینانەی كە لە ڕووش‌ـڕووش بوونەوەی لێواری قوماش بەرگری دەكا.

**پاكسازی** / pāksāzî، ـھا/:اسم ١. هەڵوەژێری؛ وەژار؛ بژار؛ كار و ڕەوتی تەمیس‌كردن؛ خاوێن‌كردنەوەی شوێنێك لە پیسی ‹پاكسازی خیابانها: خاوێن‌كردنەوەی شەقام› ٢. وەژار؛ بژار؛ وەدەركردن؛ دەركردنی دژانی ڕامیاری یا ئەندامانی

ناشایست لە دامەزراوەیەکدا ‹دیروز چند استاد و دانشجو از دانشگاه پاکسازی شدند: دوێنێ چەن مامۆستا و خوێندکار لە زانکۆدا وەلاز کران› ٣. کار و ڕەوتی پالاوتن؛ پاک‌کردنەوە؛ لەنێو بردن یان حەشاردانی ئەو بەڵگانەی کە دەتوانن ببنە هۆی گیرکەوتن ‹بچەها زود خبرشدند و خانه را پاکسازی کردند: دۆستان زوو خەبەردار بوون و ماڵەکەیان پالاوت›.

**پاک‌کن** / pāk.kon، ـها/: اسم. ڕەنک؛ پاکون؛ بماڵ؛ ماکێکی لاستیکی کە بۆ پاکەوەکردنی نووسراوە کەڵکی لێ وەردەگیرێ.

**پاک‌کننده** / pāk.konande، ـها/: اسم. پاک‌کەرەوە؛ ڕەنک؛ خاوێن‌کەرەوە؛ هەر ماکێکی کیمیاوی کە پیسی ئەسڕێ (وەکوو ساون، شامپۆ و…).

**پاکنویس** / pāknevîs، ـها/: اسم. پاکنووس ‹هر شب مقالەی پدرم را پاکنویس می‌کردم: هەموو شەوێک وتارەکانی بابم پاکنووس دەکرد›.

**پاکنه** / pākane/: اسم. جێ پێیەک کە لە قەدی دیواری بیر و چاڵدا بۆ چوونە خوارەوە و هاتنەوە بان (وەکوو پلیکان) چێدەکرێ.

**پاکی** / pākî/: اسم. پاکی: ١. تەمیسی؛ پاکژی؛ خاوێنی ٢. [مجازی] نیازانی؛ دڵپاکی؛ دڵسافی؛ دۆخ یان چۆنیەتی پاک بوون ‹آدم به این پاکی کمتر دیده‌ام: مرۆی بەم پاکیەم زۆر کەم دیوە›.

**پاکیزگی** / pākîzegî/: اسم. خاوێنی؛ پاکی؛ بژونی؛ پاقژی؛ تەمیزی؛ تەمیسی ‹انگار این خانه پاکیزگی برنمی‌دارد: وادیارە ئەم ماڵە خاوینی هەڵناگرێ›.

**پاکیزه** / pākîze/: صفت. خاوێن؛ بێ گەرد؛ بێ خەوش؛ پاک: ١. تەمیس؛ پاقژ؛ پاکژ؛ پاکیزە؛ پاکتاو؛ تەمیز؛ بژون؛ پوختە؛ ساف؛ سفت‌وسۆ ‹خانەی پاکیزە: ماڵی خاوین› ٢. [مجازی] تەواو؛ بێ کەمایەسی؛ بێ کورتی ‹رفتار پاکیزە: ئاکاری بێ‌خەوش›. هەروەها: **پاکیزه بودن؛ پاکیزه شدن؛ پاکیزه کردن**

**پاکیزه‌خو** / pākîzexû/: صفت. [ادبی، مجازی] ئاکارچاک؛ خدەباش؛ دەروون‌پاک. هەروەها: **پاکیزه‌سرشت؛ پاکیزه‌نهاد**

**پاگرد** / pāgard، ـها/: اسم. ڕێ‌نشیف؛ نشیفی؛ ئالین؛ باداک؛ جێ سووڕدانەوە و وچان لە دوای ریزێک پلەکان یان لە پێش ئاسانسوردا.

**پاگشا** / pāgošā/: اسم. [مجازی] باوەخۆن؛ باوەخوونی؛ باوەخۆنی؛ باوەخۆند؛ پاکردنەوە؛ پاگوشا؛ چرینەوە؛ یەکەمین میوانی بۆ زاوا و بووک، پاش زەماوەندیان ‹دیروز پسر عمویم با زنش آمده بودند پاگشا: دوێنێ کوڕە مامم دەگەڵ ژنەکەی باوەخون کران›.

**پاگودا** / pāgodā، ـها/: [؟] اسم. پاگودا؛ پەرستگەهی ڕۆژهەلاتی دوور.

**پاگون** / pāgûn, pāgon/: [روسی] ☜ سَردوشی ـ٢

**پاگیر** / pāgîr/: صفت. [گفتاری، مجازی] پێ‌گیر؛ پاگیر؛ دەردی‌سەر؛ پڕ لە گیروگرفت؛ هەر شتێک کە بە هۆی ئەوەوە مرۆ تووشی ڕەنج و ئازار بێت (وەکوو قەرز، بوختان، تۆمەت و…).

▣ **پاگیر شدن**: ١. سەقامگیر بوون؛ نیشتەجێ بوون؛ جێ‌گیر بوون؛ دامەزران؛ بنە داکوتان؛ پاگیر بیەی؛ مانەوە لە شوێنێکدا ‹در مریوان کاری پیدا کرد و همانجا پاگیر شد: لە مەریواندا کارێکی دۆزیەوەو هەر لەوێش سەقامگیر بوو› ٢. گرفتار بوون؛ گیرکردن؛ گیرۆدە بوون ‹پاگیر بنایی خانەاش شدە: گیرۆدەی کردنەوەی ماڵەکەی

بووە›.

**پـال** / pāl/: *اسم.* پـال؛ سیستەمێکی نیشاندانی ڕەنگ لە تەلەویزیۆنی ڕەنگیدا.

**ـپالا** / pālā/: *پیوازه.* ـ پالێو؛ ـ پالۆ؛ ـ پەرز؛ ـپالێوە؛ پاڵفتەکەر ‹شیرپالا: شیرپالیو›.

**پـالادیم** / pālād(i)yom/: [فرانسوی]*اسم.* پـالادیۆم؛ تـوخمی کیمیـایی کـانزایی بـە ژمـارەی ئـەتـومی ٤٦ و کێشی ئـەتـومی ١٠٦،٤، کانزایەکی سپی زیوی و نەرمە.

**پـالار** / pālār/: *اسم. [معماری]* کۆڵـەکـە؛ کۆڵـەکـێ؛ پاڵـەر؛ تـیرەک؛ تـیر؛ دیلـەک؛ دیـرەک؛ دیـرەگ؛ سـتوون؛ هـەسـوون؛ ئەستوون؛ ئەستوندەک؛ ئەستونگ.

**پـالان** / pālān، ـهـا/: *اسم.* کوپـان؛ کوپانـە؛ کورتـان؛ کوپـەلان؛ کوپـەلێن؛ پالـۆ؛ پـالان؛ جل‌وجۆر؛ جیاز.

▣ **پالان خر دجال:** *[کنایی]* هـەرگـە هـەسە؛ کاری پڕ دەردیسەر و بێبڕانەوە.

▣ **پـالان کـردن:** کوپـان کـردن: ١. گـورج کردنـەوەی چوارپـێ ٢. *[مجازی]* خاپانـدن؛ فریـودان؛ لابانـدن؛ هـەڵـخەڵـەتانـدن و کـار کێشانەوە لە کەسێک.

**پـالان کـسی کـج بـودن:** *[مجازی]* پاشـەڵـی کـەسـێ قـوڕاوی بـوون؛ لار بـوون؛ خـاوەن ئاکـاری خـراپ بـوون ‹مـی‌گفتنـد پـالانش هـم کـج بـوده و بـا آدمهـای نابـاب رفـت‌وآمـد داشـت: ئـەیـانگوت پاشـەڵـی قـوڕاوی بـووە و دەگـەڵ خوت و خوێڕیدا هات‌وچۆی کردووە›.

**پـالاون** / pālāvan، ـهـا/: *اسم.* پالـوێنە؛ پالـوێنکە؛ ڕاوەک؛ پـەرزەوانـە؛ ئـامرازی پالاوتن.

**پـالایش** / pālāyeš، ـهـا/: *اسم.* پالایـشت؛ کـار یـان ڕەوتی پـالاوتن: ١. پاڵـفتەکـردن؛ پـاک کردنـەوەی داهاتێـک بـە تایبـەت تـراو (وەک شیر و . . .) لـە ناپـاکی ٢. بـەرهـەم هێنـانی داهـاتێکی کیمیـاوی لـە مـاکێکی تێکـەڵاو ٣. جیاکردنەوەی تراو لە گیرساو.

**پالایـشگاه** / pālāyešgāh، ـهـا/: *اسم.* پالاوگـە؛ پالێوگە: ١. کارخانـەی پـالاوتنی نـەوت و گـاز ٢. کارخانـەی دەرهێنـانی مـاکی پیترۆشـیمی لە نەوت و گاز.

**پالاینـده** / pālāyande، ـهـا؛ ـگـان/: *صفت.* پالێوەر؛ پارزینـگ؛ پـەرزەوان؛ بـە دانـستە یـان توانی پالاوتنەوە.

**پالایه** / pālāye، ـهـا/: *اسم.* پـەرزوانـە؛ پالـوانە؛ پالوێنە؛ سافۆ؛ پادزن.

**پالئوزوئیـک** / pāle'ozo'îk/: [فرانـسوی] ☜ **دیرین‌زیوی**

**پـالئوژن** / pāle'ojen/: [؟]*اسم.* پـالیئۆژین؛ دوو خـولی ئۆسـن و لیگۆسـن لـە خـولی سێهەمی زەوین‌ناسیدا.

**پالئوسـن** / pāle'osen/: [؟]*اسم.* پالیئۆسـین؛ خـولی یـەکـەم لـە دەورەی یـەکـەمی زەوین‌ناسیدا.

**پـالئوگرافی** / pāle'og(e)rāfî/: [؟] ☜ **دیرین‌نگاری**

**پالئولیتیک** / pāle'olîtîk/: [؟] ☜ **پارینەسنگی**

**پالـت** / pālet، ـهـا/: [فرانسوی]*اسم.* پالێـت: ١. تـەختـەڕەنگی نـەقاشـی و ڕەسـم‌کێـشان ٢. چێوی ژێر کالا لە ئەنباردا.

**پـالتو** / pāltow, pālto:، ـهـا/: [فرانسوی]*اسم.* پاڵـتاو؛ باڵـتاو؛ پاڵـتۆ؛ باڵـتۆ؛ باڵـتە؛ پاڵـتە؛ سـاقۆ؛ سـاقتۆر؛ قـاپووت؛ بالاپۆشـێک لـە قوماشی ئەستوور.

**پـالس** / pāls، ـهـا/: [انگلیسی]*اسم.* پالـس: ١. *[نامتداول]* فرکـە؛ لـەرە؛ تـەکـان؛ لێـدان؛ تلـدان ٢. گـۆڕانی چـەندیـەتی شـەپـۆلی ئـەلکترۆمێغناتیـسی لـە چوارچێـوەی کـاتی دیاریکراودا.

**پالونـک** / pālû'ak/: [؟]*اسم.* نـاودیوار؛

قووڵکەی بن دیوار (جێ چراتۆری و ...).

**پالودن** / pālûdan/: مصدر. متعدی. [ادبی] //**پالودی**: پالاوتت؛ **می پالایی**: دە پاڵێوی؛ **بپالا**: بپاڵێوە// پالاوتن؛ پالافتن؛ پاڵفتن؛ پاڵۆتن؛ پەرزنەی؛ پەرزنای: ١. بە پاڵوێنەدا کردن ٢. پالاوتن؛ پالایشت کردن. هەروەها: **پالودنی**

■ صفت مفعولی: **پالوده** (پاڵێوراو)/ مصدر منفی: **نپالودن** (نەپالاوتن)

**پالوده**[1] / pālûde/: اسم. پالاوتە: ١. فالوودە؛ پاڵوودە؛ خواردنێکە ڕشتەئاسا، تێکەڵی شەربەتی قەندو عارەقەی بۆنخۆشی دەکەن و دەیخۆنەوە ٢. خواردەمەنی جۆراوجۆر کە لە قەند و میوەی کوتراو و بۆنی خۆش چێدەکرێ ‹پالودەی سیب: پالاوتەی سێو›.

**پالوده**[2]: صفت. پاڵێوراو؛ پالاوتە؛ پاڵیوراو؛ پالیا؛ پەرزیا؛ پاک‌کراو؛ پالفتەکراو.

**پالی** / pālî/: اسم. پاڵی؛ یەکێک لە زمانە هیندوئێرانیەکان کە لە هینددا باوە و زمانی ئەدەبی و خواپەرەستی دەستەیێک لە بوودایيەکانە.

**پالیز** / pālîz، ـها/: اسم. کیار؛ بێستان؛ بێسان؛ بوستان؛ تەرەکاڵی (خەیار، تەماتە، شووتی، کاڵەک و ...): **جالیز**

**پالیزبان** / pālîzbān، ـها؛ ـان/: اسم. بێستانەوان؛ بێسانەوان؛ بێسانبان؛ دەشتەوان: **جالیزبان**

**پامال** / pāmāl/: صفت. [گفتاری] پاماڵ؛ پێشێل؛ پێخوس؛ پێخوست؛ بەرپێدراو؛ پاساو؛ مچ؛ پێ‌ڕێ‌خراو؛ وەژێرپێ‌نراو؛ ژێرپێ‌خراو.

**پامچال** / pāmčāl، ـها/: اسم. گولبەهار؛ گوڵبەهار؛ هەراڵە بەهارە.

**پامنبری‌خوان** / pāmambarîxān, pamembarî-, pamanbarî-، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی/ فارسی] اسم. ١. [مجازی] لاگر؛ لاگیر؛ کەسێ کە لە ڕەوتی قسەی یەکێ‌تردا بۆ پشت‌گری لە قسەکانی، شتێک بێژێ ٢. شینگێڕ؛ تازیەگەڕێن.

**پان‌اسلامیسم** / pān'eslāmîsm/: [فرانسوی/ عربی/ فرانسوی] اسم. یەکێتی‌ئیسلام؛ یەکگرتنی موسوڵمانان و ولاتە ئیسلامیەکان.

**پان‌اسلاویسم** / pān'eslāvîsm/: [؟] اسم. یەکێتی ئیسلاوەکان؛ یەکگرتوویی ولاتە ئیسلاوەکان.

**پان‌ترکیسم** / pāntorkîsm, -turkîsm/: [فرانسوی/ ترکی/ فرانسوی] اسم. یەکێتی تورکان؛ یەکگرتوویی هۆز و ولاتی تورک.

**پانتوگراف** / pāntog(e)rāf، ـها/: [فرانسوی] اسم. پانتۆگراف؛ ئامێرێک بۆ وێنە هەڵگرتن، چوار میلەی هەیە کە هەموو لاکانی بە قەد یەکن و هەروەها باسکێکیشی هەیە کە ئەویش پێنووسێکی بە سەرەوەیە بۆ وێنەکێشان.

**پانتومیم** / pāntomîm/: [فرانسوی] اسم. پانتۆمیم؛ چەشنێ شانۆی بێ‌وتارە کە تێیدا شانۆگەران، بە گەڕان و بزوان هاوەدەنگی مووسیقا، چیرۆکێک دەگەڕێننەوە.

**پانته‌ئیسم** / pānte'îsm/: [فرانسوی] اسم. هەمووخوودایی؛ ئایینێک کە هەموو هێزەکانی سروشتی بە خودا دەزانێ.

**پانچ** / pānč، ـها/: [انگلیسی] اسم. پانچ؛ ئامرازێ کە ئاگاداریەکانی بە کون‌کون کردنی کاغەز یان مقەبا ڕادەگەیێنێ.

**پاند** / pānd/: [انگلیسی] ☜ **پُوند ـ١**

**پاندا** / pāndā، ـها/: [فرانسوی/ انگلیسی] اسم. پاندا: ١. گیانەوەرێکی گوانداری وەک ورچە، گیا دەخوا و لە ناوچەی ئاسیای

ڕۆژهەڵاتدا دەژی، ١,٨ میتر درێژە، کلکی کورت و کولکەی زۆری بازەڵەی هەیە ٢. گیانەوەرێکی گوانداری پچووکی ڕاکونئاسا، لە ئاسیای ڕۆژهەڵاتدایە، ڕەنگی پێستی بەڕوویی ڕۆشن یان خورمایی و کلکی درێژ و ئەستوورە.

**پاندول** / pāndûl، ـها/: [فرانسوی]/اسم. شۆقە؛ مەندۆڵ؛ باندۆڵ؛ شۆڕداهێڵراو لە کاتی بزووتندا.

**پانزده**[1] / pānzdah/:/اسم. پازدە؛ پانزە؛ ژمارەی نێوان چاردە و شازدە.

**پانزده**[2]: *صفت* ١. پازدە؛ پانزە؛ دانەیەک زیاتر لە چاردە ٢. پانزەمین؛ پانزدەهەم.

**پانزدهم** / pānzdahom/: *صفت*. پازدەهەم؛ پانزەهەم؛ لەڕیز، پێگە یان جێگەی پانزەدا.

**پانزدهمی** / pānzdahomî/: ضمیر. پازدەهەمی؛ ئەوەی لە ریز، پێگە یان جێگەی پانزەهەمدا بێ.

**پانزدهمین** / pānzdahomîn/: صفت. پازدەهەمین؛ لە ریز، پێگە یان جێگەی پانزدەهەمیدا.

**پانسمان** / pāns(e)mān، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پانسمان؛ برینپێچی؛ وەرپێچە.

**پانسیون** / pānsiyon، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پانسیۆن؛ یانە یان ڕێکخراوەیەک کە بە دانی پارەیەکی مانگانە و دیاریکراو تێیدا نیشتەجێ دەبن.

⊡ **پانسیون کردن**: پانسیۆن کردن؛ لە بەرامبەر وەرگرتنی پارەوە، دابینکردنی شوێن خەو و خۆراکی کەسێک.

هەروەها: **پانسیون شدن**

**پانسیونر** / pānsiyoner، ـها/: [فرانسوی]/اسم. مزڵژی؛ پانسیۆنێر؛ کەسێ کە لە پانسیۆن دەژێ.

**پانصد**[1] / pānsad/:/اسم. پێنجسەد؛ پێنسەد؛ پانسەد؛ پانسەو؛ ژمارەیەک زیاتر لە چوارسەد و نەوەد و نۆ.

**پانصد**[2]: *صفت* ١. پێنجسەد؛ پێنسەد؛ پانسەد؛ دانەیەک زیاتر لە چوارسەد و نەوەد و نۆ ٢. پێنسەدەم.

**پانصدم** / pānsadom/: *صفت*. پێنجسەدەم؛ پێنسەدەم؛ پانسەدەم؛ لە ریز، پێگە یان جێگەی پانسەددا.

**پانصدمی** / pānsadomî/: ضمیر. پێنجسەدەمی؛ پانسەدەمی؛ پێنسەدەمی؛ لە ریز، پێگە یان جێگەی پانسەدەمدا.

**پانصدمین** / pānsadomîn/: صفت. پێنسەدەمین؛ پێنجسەدەمین؛ پانسەدەمین؛ لە ریز، پێگە یان جێگەی پانسەدەمیدا.

**پانعربیسم** / pān'arabîsm/: [فرانسوی/ عربی/ فرانسوی]/اسم. یەکێتی عەرەبی؛ یەکگرتنی هەموو وڵات یان خێڵە عەرەبەکان.

**پانک** / pānk/: [انگلیسی]/اسم. پانک؛ بزووتنەوەی لاوە ڕۆژاواییەکان، دژ بە کۆمەڵ و بڕواکانی.

**پانکراتین** / pānk(e)rātîn/: [فرانسوی]/اسم. *[فیزیولژی]* پانکراتین؛ بەرهەمی ئەندامی پانکراس (لەوزولمیعدە).

**پانکراس** / pānk(e)rās/: [فرانسوی]/اسم. پانکراس؛ لەوزولمیعدە.

**پانکی** / pānkî/: [انگلیسی] صفت. پانکی: ١. لایەنگری پانک ٢. خاوەن ڕەنگ و شێوەی لایەنگرانی پانک ‹آرایش پانکی: ئارایشتی پانکی›.

**پانگولن** / pāngolan، ـها/: [؟]/اسم. مێروولەخۆر؛ پانگولەن: **اُمّقرفه**

**پانل** / pānel، ـها/: [انگلیسی/ فرانسوی]/اسم. دەبکری: ١. ڕووپەڕێکی چوارگۆشە لە چێو، کانزا یان شیشە کە بۆ ئاگاداری لە سەری

وێنە یان نووسراوە لێدەدەن ٢. ڕووپەڕێک کە لە سەری کلیل و چورتەکانی ئامرازێک دامەزراوە.

**پانما** / pānemā/: *صفت.* پانوێن؛ بە تایبەتمەندی نواندنی پێوە (بە هۆی ناسکیەوە) ‹جوراب پانما: گۆرەوی پانوێن›.

**پانوشت** / pānevešt، ـها/: *اسم.* پەراوێز؛ ژێرنووس؛ ژێدەر؛ چمک؛ بنتیک؛ پەین‌نویس؛ چێرنویس.

**پانویس** / pānevîs، ـها/: *اسم.* پەراوێز؛ ژێرنووس؛ ژێدەر.

**پاورچین** / pāvarčîn/: *قید.* پێ‌دزە؛ پێ‌خشکە؛ پێ‌دزکێ؛ پاچرکێ؛ بە خشکە؛ قولەپسکێ؛ بزدم؛ تەلە تەلە؛ ماتەمات؛ پسووپسوو؛ هێدی و بێ‌چرکە؛ لە سەر پەنجە ڕۆیشتن.

**پاورقی** / pāvaraqî، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* پەراوێز؛ ژێرنووس ‹یادت نرود، پاورقی‌ها را هم حروفچینی کنی: لەبیرت نەچێ، پەراوێزەکانیش پیت‌چنی کەی›.

**پای** / pāy/: *اسم* ١. *[ادبی]* پا؛ پێ ٢. /ـها/ [انگلیسی] پای؛ جۆرێ شیرینی میوەشی تێدەکەن.

**پای** / pāye/: *حرف.* لای؛ پای؛ پاو؛ پێس: ١. سەر؛ کن؛ تەنیشت ‹پای سفره: سەر سفرە› ٢. لە بەشی خوارووی شتێک؛ بەرامبەری سەروو ‹پای درخت: لای دار›.

**پایا** / pāyā/: *صفت.* خۆگر؛ خۆڕاگر؛ خۆگرتی؛ پایدار؛ بەردەوام؛ قایم.

**پایائی** / pāyā'î/ ☜ **پایایی**

**پایاب** / pāyāb/: *اسم. [ادبی]* ١. /ـها/ بن؛ بنی‌ئاو؛ بیخ؛ قوت؛ پەی؛ قوولیگا ‹دریای بی‌پایاب: زەریای بێ‌بن› ٢. *[ادبی]* هێز؛ توان؛ گور؛ تابشت ‹ارباب بی‌پایاب: ئاغای بێ‌هێز› ٣. /ـها/ بوار؛ بگار؛ ویەردی؛ ویەر؛ وێر؛ دەراو.

**پایاپای** / pāyāpāy/: *صفت.* ڕشت؛ سەربەسەر؛ سەرووسەر؛ یەکبەیەک؛ گۆڕینەوەی بەبێ باقی‌دانەوە یان سەندنەوە ‹معاملەی پایاپای: مامەڵەی ڕشت›.

**پای‌افزار** / pāyafzār، ـها/: *اسم. [ادبی]* پێڵاو؛ پالا؛ کەوش؛ کالە؛ شەکال؛ ستەک؛ سۆلک؛ موزک؛ خاروک؛ قاچی؛ پێتاوە: **پاافزار**

**پای‌افشار** / pāyafšār/: *صفت.* پاشێل؛ پاکوت؛ پێ‌شێل. بەرانبەر: **دست‌افشار**

**پایان** / pāyān/: *اسم.* کۆتایی؛ کۆتاهی؛ دوایی؛ دمایی؛ دوماهی؛ ئاخر؛ برانەوە؛ پایان؛ سەر؛ قوتار؛ قورتاڵ: ١. خاڵ و خێڵ یان سنووری تەرخان کراوەی ئەندازەی شتێک ‹پایان عمر: کوتایی ژیان› ٢. هەرکام لە دوو سەرەی ڕاستای شتێک ‹پایان خیابان: ئاخری شەقام› ٣. دوورترین خاڵ لە خاڵی سەرەتاوە ‹پایان راه: برانەوەی ڕێگا› ٤. خاڵی گەییشتن لە کار، دیاردە یان ڕەوتێکدا ‹پایان جنگ: کوتایی شەڕ› ٥. چۆناوچۆنی تەواو بوونی بەرهەمێکی هونەری یان پیشەیی ‹پایان داستان: دوایی چیرۆک› ٦. چۆنیەتی و بار و دیاری سەردەمی تەواو بوونی شتێک ‹پایان سال: کوتایی ساڵ›.

▣ **پایان پذیرفتن** ☜ **پایان یافتن/ گرفتن**

**پایان دادن:** تەواوکردن؛ دوایی پێ‌هێنان؛ دواهێنان؛ کۆتایی هێنان؛ برینەوە؛ ڤەبرین؛ دمایی پنەئاردەی ‹به این گفتگو پایان بده: ئەم وتووێژە تەواوکە›: **به پایان رساندن**

**پایان یافتن/ گرفتن:** تەواو بوون؛ بران؛ دوایی هاتن؛ خەلاس بوون؛ کۆتایی هاتن؛ دمایی ئامەی؛ دمایی پنەئامەی ‹کار پایان گرفت: کارەکە دوایی‌هات›: **پایان پذیرفتن؛ به پایان رسیدن**

**بە پایان آمدن**: *[ادبی]* کۆتایی هاتن؛ بە ئاکام گەییشتن؛ دوایی هاتن ‹بە پایان آمد این دفتر: ئەم دەفتەرەش کوتایی‌هات›.

**بە پایان رساندن** ☜ **پایان دادن**

**بە پایان رسیدن** ☜ **پایان یافتن/ گرفتن**

**پایان‌بخش** / pāyānbaxš/: *صفت*. دوایی‌هێنەر؛ کۆتایی‌هێنەر؛ کۆتایی پێ‌ هێنەر؛ کۆتاکەرەوە؛ دوایی‌دەر ‹شعری کە خواندە شد پایان‌بخش مراسم بود: شیعرێ کە خوێنرایەوە، دوایی‌هێنەری دانیشتنەکە بوو›.

هەروەها: **پایان‌بخشی**

**پایان‌نامە** / pāyān.nāme، ـها/: *اسم*. بڕوانامە؛ دوانامە؛ نووسراوەیەک کە خوێندکار دوای کوتایی هاتنی ئەزموونەکانی، سەبارەت بە بابەتێکی دەرسی خۆی لە سەری کار دەکا و دوای قەبووڵ کردنی مامۆستاکان لە زانکۆدا، بەڵگەنامەی دەرسی پێ‌دەدەن.

**پایانە** / pāyāne، ـها/: *اسم* ١. ترمینال ٢. جێی کۆ بوونەوە و بەش‌بەش بوونەوەی هێزی کارەبایی و موتوری و ...

**پایانی** / pāyānî/: *صفت*. دوایی؛ دمایی؛ ئاخری؛ کۆتایی ‹مسابقەی پایانی: کێبەرکێی دوایی›.

**پایایی** / pāyāyî/: *اسم*. خۆگری؛ خۆڕاگری؛ خۆگرتی؛ بار و دۆخ و چۆنیەتی خۆگرتن: **پایائی**

**پای‌بند** / pāyband/: *صفت*. پابەند؛ پێ‌بەند: ١. گرفتار ‹ای گرفتار و پای‌بند عیال: ئەی گیرۆدە و پابەندی خێزان› ٢. دەستەبەر ‹او بە قولش پای‌بند است: ئەو بە بەڵێنی خۆی پابەندە› ٣. گیرۆدە ‹اگر دلم نشدی پای‌بند طرەی او: ئەر دڵ گیرودەی پەرکەی نەبوایە›.

هەروەها: **پای‌بند بودن؛ پای‌بند شدن؛ پای‌بند کردن**

**پای‌بندی** / pāybandî/: *اسم*. پابەندی؛ پێوەندی؛ بار و دۆخ و چۆنیەتی پابەند بوون ‹دشمن بە هیچ چیز پای‌بندی ندارد: دژمن بە هیچ شتێک پابەندی نیە›.

**پایتخت** / pāytaxt، ـها/: *اسم*. پاتەخت؛ پێتەخت؛ پایتەخت؛ ناوەین؛ شاری ناوەندی؛ شاری شانشین ‹تهران پایتخت ایران است: تاران پاتەختی ئێرانە›.

**پای‌خر** / pāyexar، ـها/: *اسم*. تەپلەڕەش؛ گیایەکە ڕیشەیەکی پتەوی گۆشتنی هەیە و گەڵاکانی گەورە و پانە و بۆ دەرمان دەشێ.

**پایدار** / pāydār/: *صفت*. بەردەوام؛ پایەدار: ١. ڕاوەستاو؛ ڕاوێستاو؛ پایار؛ بەرقەرار؛ جێگرتوو ‹دوستیمان همچنان پایدار است: دۆستایەتیمان هەروا بەردەوامە› ٢. خۆڕاگر؛ جێ‌گیر؛ درێژەدار ‹صلح پایدار: ئاشتی بەردەوام›.

**پایداری** / pāydārî/: *اسم*. پایەداری: ١. خۆڕاگری؛ سەقام؛ بەرقەراری؛ بار و دۆخ و چۆنیەتی نەگۆڕان ‹پایداری ساختمان: سەقامی خانوو› ٢. /ـها/ ڕاوەستاوی؛ باشار ‹بر باورش پایداری کرد: لە سەر بیروبڕوای پایەداری کرد›.

**پایستگی** / pāyestegî/: *اسم*. *[فیزیک]* مانەوەیی؛ بمێنی.

**پایک** / pāyak، ـها/: *اسم*. پایەک: ١. *[کالبدشناسی]* بەنیکەی پشتیوان و پەیوەندی ڕاگری مێشک و نوخاع ٢. *[گیاەشناسی]* نێرتکە؛ دەماری گوڵ و گەڵا.

**پای‌کوبان** / pāykûbān/: *قید*. بە سەما؛ بە هەڵتیقان.

**پایکوبی** / pāykûbî، ـها/: *اسم*. *[کنایی]* هەڵپەڕکێ؛ سەما؛ زەما؛ لەیز؛ کار و ڕەوتی هەڵخستنەوە؛ هەڵبەزین؛ کشکشان؛ پلەزیقان؛ هەڵتیقان؛ ئورزان؛ هۆرپڕەی.

**پایگــاه** / pāygāh، ـهـا/:اسم. پێگـه؛ پێگـا؛ پایـه‌گـا: ١. جێگـه‌یـه‌ک بـه زنجـیره ئـامراز و دامـه‌زراویه‌کـه‌وه بـۆ ئامـانجی دیـاری‌کـراو ‹پایگـاه هـوایی: پێگـه‌ی هـه‌وایی› ٢.[مجـازی] جێگـای کـه‌لـک لـێ وه‌رگـرتنی هێـزی چـه‌کـداری و ڕامیـاری ٣. جێگـا؛ جێگـه؛ پله‌وپایـه؛ پاگـێ ‹هـر کـس بایـد پایگـاه خـود را بشناسد: هه‌رکه‌سێ ده‌بێ جێگای خۆی بزانێ›.

**پایمــال** / pāymāl/: صـفت.[مجـازی] تـه‌رت و توونا؛ ته‌فر و توونا؛ پـه‌لـخ؛ پـان و فلـچ؛ پاسـاو؛ پایه‌ماڵ؛ پاماڵ؛ لـه‌بـه‌یـن چـووگ؛ پێخوسـت؛ پێخـوس ‹در آن سـیل هرچـه داشـت پایمـال شـد: لـه‌و لافـاوه‌دا هـه‌رچێکـی هـه‌بـوو تـه‌رت و توونـا بوو›.

**پایمـــــالی** / pāymālî/:اســـم.[مجـــازی] پایه‌مالّی؛ پامالـی؛ پـێ‌شـێلی؛ پـه‌لـخی؛ پـانی؛ فـلچی؛ بـار و دۆخ و چۆنیـه‌تی تووچـان و ته‌رت‌وتوونا که‌وتـن ‹بایـد از پایمـالی حقـوق مـردم جلوگیری کرد: ده‌بـێ لـه پایـه‌مالـی مـافی خـه‌لـک به‌رگری بکرێ›.

**پـــایمردی** / pāymardî، ـهـــا/:اســـم. مـه‌ردایـه‌تی؛ مێـری؛ پاپتـه‌وی؛ خـۆڕاگری؛ مـه‌رخـوزی؛ ڕاوه‌سـتاوی ‹ایـن پیـروزی بـه سـبب پـایمردی مـردم بـه دسـت آمـد: ئـه‌م سـه‌رکـه‌وتنـه به‌هۆی مه‌ردایه‌تی خه‌لکه‌وه ده‌س‌که‌وت›.

**پـایمزد** / pāymozd، ـهـا/:اسم. قـه‌ده‌مانـه؛ کراپـا؛ کالـه‌دڕانـه؛ پالادڕانـه؛ پـامز؛ پـالامز؛ حه‌قی قه‌ده‌می ڕۆیشتنی که‌سێ بۆ کارێک.

**پاینـــدان** / pāyandān، ـهـــا/:اسم.[ادبـی] پـایوان؛ ده‌سـتـه‌بـه‌ر؛ وه‌خـۆگر؛ ئـه‌وه‌ی کـه ئاگـاداری لـه کـه‌سـێ یـان شـتێک ده‌گرێتـه ئه‌ستۆ: هه‌روه‌ها: **پایندانی**

**پاینـــدگی** / pāyandegî/:اسـم. پایـــه‌داری؛ هه‌ربوونی؛ نـه‌مـری؛ بـێ‌پێشوونه؛ بـار و دۆخ و چۆنیه‌تی به‌رده‌وامی.

**پاینـده** / pāyande/: صـفت. پایـه‌دار؛ پاینـده؛ خـۆڕاگر؛ جـێ‌قـایم؛ پاینـه؛ بـه‌رده‌وام؛ بمـێن؛ بێ‌له‌ناو چوون.

**پـایور** / pāy(e)var، ـهـا؛ ـان/:اسم ١.[قـدیمی] پایـــه‌بـــه‌رز؛ پایـــه‌وه‌ر؛ پلـــه‌دار؛ پایـــه‌دار ٢. [نامتـداول] ئـه‌فـسه‌ری پـولیس ٣. ئـه‌نـدام؛ کادێر.

**پایــه** / pāye، ـهـا/:اسم. پایـه: ١. ئـه‌ستوون؛ پلـه؛ پاچکـه؛ کۆلـه‌کـه؛ ئـه‌ستونده‌کـی چـوار گۆشـه ‹پایـه‌ی دیـوار: پایـه‌ی دیـوار› ٢. پاچکـه؛ ئـه‌سـتوون؛ ئـه‌سـتونده‌کـێ کـه شـتێک لـه سـه‌ری داده‌نـرێ ‹پایـه‌ی میـز: پایـه‌ی مێـز› ٣. [مجـازی] هـیم؛ بناغـه؛ بنـه‌ڕه‌ت؛ بنـه‌مـای شـتێک ‹فکـر پایـه‌ی عقـل اسـت: بـیر هیمـی ئاوه‌زه› ٤. مـه‌رتـه‌بـه؛ پلـه‌و پایه؛ کۆلـه‌کـه یـا جێگـای کـه‌سـێ یـان شـتێک ‹بلندپایـه: بلندپایـه› ٥. پایـه‌گـا و ئاسـتی کـه‌سێک لـه گرۆیـه‌کـدا ‹رانـنده‌ی پایـه یـک: ئـاژۆوانی پایـه یـه‌ک› ٦. جـۆرێ ڕووه‌ک و گیـا ‹دوپایـه؛ یـک‌پایـه: دووپایـه؛ یـه‌ک‌پایـه› ٧. [گیـاه‌شناسـی] پاژی وه‌ستاو له ژێر چه‌تری کارگدا.

**پایـــه‌دار** / pāyedār، ـهـا/: صـفت. پایـــه‌دار؛ بنه‌ڕه‌ت‌دار؛ بناغه‌دار.

**پایـه‌ریـزی** / pāyerîzî/:اسم. پایـه‌ڕێـژی؛ کـار یان ڕه‌وتی بنه‌ڕه‌ت دانان؛ ڤه‌ناندن.

**پـــایی** / pāyî/: صـفت. پـایی؛ تایبه‌تمه‌نـدی هه‌ر شتێ به‌هـۆی پـاوه بێـت یـان بـه پـا کـار بکا ‹چرخ پایی: چه‌رخی پایی›.

**پاییـــدن** / pāyîdan/: مـصدر. متعـدی. لازم. //**پاییـدی**: ئاگـات لـێ‌بـوو؛ **مـی‌پـایی**: ئاگـات لـێ‌ده‌بـێ؛ **بپـا**: ئاگـات لـێ‌بـێ// □ متعـدی. ١. پایین؛ ڤرسهاندن؛ نـێ‌پاوتـا؛ چـه‌مـه‌نـه داره‌ی؛ ئاگـا لـێ بـوون و چاوه‌دێـری‌کـردن ‹در آن جـا پاسـبانی، مـردم را مـی‌پاییـد: لـه‌وێـدا پاسـه‌وانێک چـاوه‌دێـری خـه‌لـکی ده‌کـرد› □ لازم. ٢.

بەردەوام بوون؛ باقی بوون؛ پایەدار بوون ‹آنچه نپاید، دلبستگی را نشاید: ئەوی پایەدار نەبێ، بۆ دڵ پێ سپاردن ناشێ› * **پائیدن**. هەروەها: **پائیدنی**

■ صفت فاعلی: **پاینده** (ـــ)/ صفت مفعولی: **پاییده** (ـــ)/ مصدر منفی: **نَپاییدن** (ئاگا لێ‌نەبوون)

**پاییز** / pāyîz/:/اسم. پاییز؛ پایز؛ پاییژ؛ پەهیز؛ پەیز: ١. /ـها/ سەردوا؛ چڕی؛ یەکێک لە چوار وەرزی ساڵ؛ سێهەم کژی ساڵ ٢. /کنایی/ خەزان؛ زەردی؛ ئەنگۆرەی پیری و ژاکان ‹پاییز عمر: خەزانی تەمەن› * **پائیز**

**پاییزه** / pāyîze/: صفت. پاییزە؛ پێوەندیدار بە پاییزەوە (محصول پاییزه: داهاتی پاییزە) * **پائیزه**

**پاییزی** / pāyîzî/: صفت. پاییزی؛ سەر بە پاییز ‹هوای پاییزی: هەوای پاییزی›: **پائیزی**

**پایین**[1] / pāyîn/:/اسم. خوار؛ خار؛ وار؛ هار؛ پەین؛ ئۆدی: ١. جێگایەک لە شوێنی نزمترەوە ‹پایین را بگرد: خوارەوە بگەڕە› ٢. بەشی ژێرووی شتێک ‹پایین دیوار نم گرفته: خوار دیوارەکە نمی داوە› * **پائین**

**پایین**[2]: صفت. ١. پەست؛ نزم؛ نەوی؛ نقی؛ نەقی؛ نشیف؛ خوار؛ ئۆدی ‹مقام پایین: پلەی پەست› ٢. هەرزان ‹بهای پایین: بایی هەرزان› ٣. خواروو؛ ژێرگ؛ خوارگ؛ خواری؛ هار؛ وارین؛ چێرین ‹طبقەی پایین: نهۆمی خواروو› * **پائین**

**پایین**[3]: قید. خوار؛ وار؛ هار: ١. لە خوارەوە؛ دەسخوار؛ لە بەشی ژێروو ‹پایین دیوار افتاده بود: لە خوارەوەی دیوارەکە داکەوتبوو› ٢. بەلای خوارەوە ‹برو پایین: بچۆ خوارەوە› ٣. خوار؛ خوارەوە؛ لە نزیکی دەرگاوە ‹پایین اتاق نشسته بود: لە خوار دیوەکەوە دانیشتبوو› * **پائین**

▣ **پایین افتادن**: داکەوتن؛ داکەفتن؛ کەوتنە خوار؛ بەر بوونەوە؛ ئەرەکەوتەی؛ کەوتەیرە واری.

**پایین آمدن**: هاتنە خوار؛ دابەزین؛ داخۆزین؛ داخۆستن؛ ئامایرە وار؛ ئەرەوەسەی؛ وەسەیرە.

**پایین آوردن**: ١. هێنانە خوارەوە؛ داهێنان؛ داکێشان؛ داگرتن؛ نەوی کردن؛ ئاردەیرەوار؛ ئەرەوەزنەی ٢. کەم‌کردنەوە؛ کزکردنەوە؛ هندکاندن.

**پایین انداختن**: داخستن: ١. خستنە خوارەوە؛ وسەیرەوار؛ بەرەو خوارەوە فڕە دان ‹گلدان را پایین انداخت: گوڵدانەکەی خستە خوارەوە› ٢. شۆڕەوەکردن؛ وسەیرە ‹سرش را پایین انداخت: سەری داخست›.

**پایین پریدن**: داپەڕین؛ پەڕینە خوار؛ پەڕینە خوارەوە؛ گەڵوازکردن؛ ئەرەپڕەی.

**پایین رفتن**: ١. چوونە خوارەوە؛ داچوون؛ نەسیان؛ ئەرەلوەی؛ لوایرەوار؛ بەرەو نەوی ڕۆیشتن ٢. داخزین؛ کەم بوونەوە؛ کز بوونەوە.

**پایین کشیدن**: داکێشان؛ هێنانە خوارەوە؛ داهێنان؛ کێشتەیرە؛ ئەرەکێشتەی؛ کەسێ یان شتێک بە زۆر هێنانە خوارەوە.

**پایینِ** / pāyîne/: حرف. لەخوارەوەی؛ لە پای؛ واروو ‹پایین اتاق نشست: لە خوارەوەی ژوورەکەوە دانیشت›.

**پایین‌تنه** / pāyîntane، ـها/:/اسم. پاقەد؛ پاگژ؛ لای خوارووی لەش، لە کەمەرەوە بەرەو خوار.

**پایین‌دست** / pāyîndast/:/اسم. بەشی خواروو؛ پەین دەس؛ بەشی ژێروو ‹پایین‌دست رودخانه: بەشی خوارووی رووبار›.

**پـــــایینی**[1] / pāyînî/: *صـــفت.* خـــوارین؛ خـوارگین؛ ژێـرین؛ ژێـرگین؛ ژێرینـه؛ واریـن؛ خواروو؛ هـار؛ لای ژێـروو ‹کتـاب پـایینی: کتـێبی خوارین›: **پائینی**

**پـایینی**[2] /ـهـا/: *ضـمیر.* خـوارین؛ خـوارگین؛ وارین؛ ئەوی وا لـه ژێـر باقیـەوەیـە ‹پـایینی هـم افتاد: خوارینەکەش داکەوت›: **پائینی**

**پپـه** / pape، ـهـا/: *صـفت.[گفتـاری]* سـەپـۆل؛ پەپل؛ پەخمە؛ هـەپـە ‹آدم ایـن قـدر پپـه!: مـرۆی ئەوەندە سەپۆل!›.

**پـت**[1] / pat/: *اسـم.* گولـۆلـە؛ گورۆلـێ؛ گـلۆلە؛ گـلولەی بـەن، خـوری، مـوو یـان هەرشـتێکی لەو چەشنە.

**پـــت**[2]: *صـفت.[مخفـف]* پـانوپـۆڕ؛ تـەختـان؛ ڕاستک؛ بێ کەندوکلۆ.

**پتاســـیم** / potās(i)yom/: [فرانـــسوی]/*اســـم.* پوتاســیۆم؛ تــوخمی کیمیــایی کــانزایی، بــه ژمــارەی ئــەتــومی ١٩ و کێــشی ئــەتــومی ٣٩،١٠، سـپی زێـوی، نـەرم و سـووکە و لـە سروشتدا بە فراوانی هەیە.

◙ **پتاسیم سیانید** ☜ سیانور پتاسیم، **سیانور**

**پتانـسیل** / potānsiyel، ـهـا/: [فرانـسوی]/*اسـم.* گریک؛ وره؛ وزه؛ لێهاتوویی؛ پوتانسیێل.

**پـــت‌ـــپـــت** / petpet/: *صـوت.* ١. پـلتەپـلت؛ پرتــەپــرت؛ دەنگــی فتیلــەی چــرا، کاتێــک نزیـک لـه کوژانـەوەیـە ٢. پـرەپـر؛ دەنگـی موتور، کاتێک خراپ کار دەکا.

◙ **به پت‌ـپـت افتـادن:** کـەوتنـه پرتـەپرتـەوە: ١. لـەکارکـەوتـن؛ پـەککـەوتـن؛ لـه هێـز کـەوتـن ٢. *[کنایی]* لـه وزه کـەوتـن؛ هێـز نەمان ‹داداش! مثل اینکـه بـه پـت‌ـپـت افتـاده‌ای: برا! وادیاره کەوتوویتە پرتەپرتەوە›.

**پتـک** / potk، ـهـا/: *اسـم.* حورتـەک؛ کوتـک؛ پتیـک؛ خـوتره‌ک؛ خوتـەک؛ پتـک؛ تـۆپز؛ مەترەق؛ مەیکوت؛ مێکوت؛ مێرکوت؛ پیک.

**پتـــو** / patû، ـهـا/: *اسـم.* پـەتـوو؛ ئـەدیـاڵ؛ ســەردان؛ نــقینپــۆش؛ نــقینۆ؛ پێخــەف؛ سەرەنناز.

◙ **پتوی برقـی:** سـەردانی کـارەبایی؛ پـەتـوی بەرقی؛ جۆرێ پەتوو کـه سـیمی تـێ خـراوه و به هێزی کارەبا گەرم دەبێ.

**پـــتوپـــاره** / pat-o-pāre/: *صـــفت.[گفتـــاری]* لەت‌وپەت؛ شڕو وڕ؛ زۆر دڕاو.

**پـــتوپهـــن** / pat-o-pahn/: *صـــفت.[گفتـــاری]* پـان و پـۆڕ؛ تـەختـان؛ ڕاسـتک؛ پـان و هـەراو؛ پان و فرەه.

**پته** / pate، ـهـا/: *اسم.* پـەتـە: ١. *[قـدیمی]* بلیـت؛ پـسووله ٢. *[قـدیمی]* کووتـە؛ پـەنـگ؛ چـیم؛ کۆمەڵـی گـژ و گیـا و چـڵ و چێـو بـۆ گـرتنی بەری ئاو.

◙ **پته را به آب‌دادن:** *[کنایی]* تـەختـە خـستنه سـەر ئـاو؛ کـار خـراپکـردن؛ کـار تێـکدان ‹نتوانـستی زبانـت را نگهـداری و پتـه را بـه آب دادی؟: نەتتوانی بـەر زمانـت بگـری و تـەختـەت خسته سەر ئاو؟›.

**پتـەی کـسی را روی آب انـداختن:** *[کنـایی]* تــەختــەی کــەسێـک خـستنه سـەر ئـاو؛ ئابــرووی کــەسـێک بــردن؛ کــەسێک بێ‌ئابڕووکردن ‹آمـد اینجـا و پتـەی همکـارش را انـداخت روی آب: هاتــه ئێــره و تــەختــەی هاوکارەکەی خسته سەر ئاو›.

**پتـــی** / patî/: *صـفت.[گفتـاری]* پـەتی؛ ڕووت؛ خواس؛ خاوس.

**پتیــاره** / pat(i)yāre، ـهـا/: *صـفت.* پـەتـەری؛ ســەڵــیتە؛ پــەتیــاره؛ گــەللایــی؛ شــێتۆکە؛ ئەقڵسووک ‹دختـرەی پتیـاره، دست بـه کمـر زده، می‌گوید: شـما سـاکت باشـید!: کچـەتیـوی پـەتـەری، دەستی ناوەتە کەلـەکـەی، دەڵـێ: ئێـوه بـێ‌دەنـگ بن!›.

**پچ‌ــپـچ** / pečpeč، ـهـا/: *صـوت.* سـرتە؛ چپـە؛

پچـه؛ چفـه؛ پتـه؛ پچـه‌پـچ؛ چرپـه‌چـرپ؛ سـرکه‌سـرک؛ پـسه‌پـس؛ پـسته‌پـست؛ چپ_چپ؛ سرپه‌سرپ؛ سـرته‌سـرت؛ فچـه‌فـچ؛ فـچ_فـچ؛ وتـه‌وت؛ ده‌نگـی قـسه‌کـردنی زۆر نزمی دوو که‌س پێکه‌وه.

⊡ **پچ_پـچ کـردن:** چپـه‌کـردن؛ چرپـه‌کـردن؛ پچه‌کردن؛ سرته‌کـردن؛ چرپانـدن؛ بـه‌سـرته قسه‌کـردن؛ سـرکه‌کـردن؛ چفانـێ؛ چرپـانن؛ چپنه‌ی؛ چپـه‌چـپ کـه‌رده‌ی ‹چه خبر شده پچ-پچ می‌کنید؟: ئه‌وه چبووه چپه ده‌که‌ن؟›.

**پچپچـه** / pečpeče، ـهـا/:اسـم ١. سـرته؛ پچه‌پچ ‹از آن سوی در پچپچـه‌ای شنید: لـه‌وبـه‌ری ده‌رکـه‌وه سـرتـه‌یـه‌کـی هاتـه بـه‌رگـوێ› ٢. خـشه‌خـش ‹پچپچـه‌ی برگهـا: خـشه‌خـشی گـه‌لاگـه‌ل› ٣./کنـایی/ ویتـه‌ویـت؛ قـوو؛ وت‌وویـری سـه‌ر زاران؛ قـسه و واتـۆی نـاو خه‌لک ‹این پچپچـه‌هـای مـردم خـسته‌ام کـرد: ئـه‌م ویته‌ویتانه‌ی خه‌لکه وه‌ڕه‌زی کردم›.

**پخ** / pax/:اسم. کـه‌ل؛ کـل؛ پـه‌خ؛ شـوێنێ کـه له چاو شوێنی‌تر لالێژه.

⊡ **پـخ زدن:** کـه‌ل‌کـردن؛ پـه‌خ لێـدان؛ لالێـژ کردنی شوێنێک له‌چاو ده‌ور و به‌ری.

**پـخ** / pex/: صـوت. کـش؛ پـخ؛ ده‌نگێکـه بـۆ ترساندن ‹پخ بکنی فرار مـی‌کنـد: کـشی لـێ بکـه‌ی هه‌لدێ›.

⊡ **پخ_پـخ کـردن:**/گفتـاری/ لـووت و گوێچکـه کردن؛ گوێ و که‌پۆ برین.

**پـخ** / pox/: [ترکـی]/اسـم. /مـستهجن/ پـۆخ؛ پیسی؛ گوو؛ گی؛ تلته‌می مرۆ.

⊡ **پخـی بـودن:**/تعـریض/ گوویـێـک بـوون؛ بـه ناڕه‌وا خـاوه‌ن پلـه و پایـه بـوون ‹مگـر او چـه پخـی اسـت کـه مـن بخـواهم از او اجـازه بگیـرم؟: ئه‌و چ گوویکه بمـه‌وێ بـه‌رایـی لـێ‌بگـرم؟›.

هه‌روه‌ها: **پخی شدن**

**پخت** / paxt/: صفت. تـه‌ختـان؛ ڕاسـتک؛ پـان؛ گۆڕ؛ بێ که‌ند و کلۆ.

**پخـــت**[1] / poxt/:اسـم. ١. کـار یـان ڕه‌وتی پێژان ‹پخت نان: نان‌کردن› ٢. /ـهـا/ نۆبـه‌ی نـان‌کـردن؛ نـان پێـژان ‹روزی دو نوبت پخت می‌کند: ڕۆژێ دوو نوبه نان ده‌کا›.

⊡ **پخـت‌کـردن:** کولانـدن؛ پـه‌زانـدن؛ پێـژان؛ پێژتن؛ پێتن؛ په‌تـه‌ی؛ پێـژان بـه‌تایبـه‌ت لـه ته‌نوور یان له کووره‌دا.

**ـ پخـت**[2]: پیـواژه. ـ پێـژ؛ ـکـرد؛ ـکـول؛ ـ ئـاو ‹دست‌پخت: ده‌ست‌پێژ›.

**پختگـی** / poxtegî/:اسـم. /مجـازی/ جێکه‌وتوویی؛ پێگـه‌ییـشتوویی؛ سـه‌رپێهـاتی؛ گرساوی؛ ڕسکاوی.

**پخـتن** / poxtan/: مـصدر. متعـدی. لازم. //**پختـی:** کولانـدت؛ **مـی‌پَـزی:** ده‌کولـێنی؛ **بِپَـز:** بکولـێنه// □ متعـدی. ١. پێـژان؛ پـێتن؛ بـرژانن؛ بوشـانن؛ پـه‌زیـن؛ پـه‌تـه‌ی؛ پـه‌هـتن؛ کـردن؛ کـه‌رده‌ی؛ ئامـاده‌کـردنی نـان و چێـشت ‹نـان پختن: نـان پێـژان› ٢. پێـژان؛ پێـژتن؛ پـێتن؛ بێتین؛ پـاتن؛ سـه‌خـت و پتـه‌وکـردن و ئامـاده کـردنی بـه‌رهـه‌مێـک (وه‌ک ئـاجۆر) لـه ڕێگـای کـووره و گـه‌رمادانـه‌وه ‹آجـر پخـتن: ئـاجۆر پێـژان› ٣./کنـایی/ نـه‌رم‌کـردن؛ تێگـه‌یانـدن؛ ئاماده کـردنی کـه‌سێک بـۆ کارێـک لـه ڕێـی وت‌ووێـژه‌وه ‹همـه دورش را گرفتنـد و او را حـسابی پختند: گشتیان ده‌وریـان دا و بـاش نـه‌رمیـان‌کـرد› ٤. کولانـــدن؛ گرینـــه‌ی؛ گرینــای؛ ئامـــاده کـردنی چێـشت و خـوراک بـه‌هـۆی گـه‌رمای زۆره‌وه □لازم. ٥. کـولان؛ کولـین؛ پێگـه‌یـین؛ گریـای؛ تـه‌یـار بـوونی پێخـۆر بـه‌هـۆی تـینی پێویسته‌وه، بـۆ خـواردن ‹غذا پخت: چێشته‌که کولا› ٦. گـه‌یـین؛ گـه‌ییـشتن؛ یـاوه‌ی؛ یـاوای؛ گه‌ییشتنی میـوه ئـاوداره‌کـان ‹زردآلوهـا حسابی پختـه‌انـد: شـێلانه‌کـان چـاک گـه‌ییـشتوون› ٧. پـرووزان؛ کـولان؛ گریـه‌ی؛ بـه‌هـۆی گـه‌رمای

زۆرەوە ئازار دیتن ‹از گرما پختم: لە گەرمادا پرووزام›. هەروەها: **پختنی**

■ صفت فاعلی: **پزنده** (پێژەر)/ صفت مفعولی: **پخته** (پێژراو)/ مصدر منفی: **نَپختن** (نەپێژان)

**پخت‌وپز** / poxt-o-paz/: *اسم.* پوخت؛ پوختوپەز؛ لێنانی شیو.

**پخته** / poxte/: *صفت.* پوختە؛ پەهتی: ١. کوڵاو؛ کولیاگ؛ گریا؛ ورد؛ ئامادەکراو بەهۆی گەرمای پێویستەوە ‹غذای پخته: چێشتی کوڵاو› ٢. *[مجازی]* لە کار دراتی؛ خاوەن ئەزموون ‹مرد پخته: پیاوی بوختە› ٣. لەبەرە چووگ؛ زۆر گەییشتوو؛ فرە گەییگ (بۆ میوە) ‹هندوانەی پختە: شووتی لەبەرە چووگ› ٤. *[مجازی]* شی کراوە؛ ورد؛ باش‌ـباش بەراوردکراو ‹فکر پختە: بیری ورد›.

**پخته‌خوار** / poxtexār، ـها؛ ـان/: *صفت.* *[کنایی]* حازرخۆر؛ خاوەنی خووی بەهرە بردن لە کار و کۆششی خەڵکی‌تر ‹خان پختەخوار: ئاغای حازرخور›.

**پختی** / paxtî/: *اسم* ١. پانی؛ گۆڕی؛ چۆناوچۆنی پان بوون ٢. *[ریاضی]* کێش‌هاتوویی؛ کێشراوی.

**پخزنی** / paxzanî/: *اسم.* کەل‌کاری؛ کار یان ڕەوتی کەل‌کێشان؛ پەخ لێدان؛ ساوین و سافکردنی لێوارەی شتێک: **پخکاری**

**پخش**[1] / paxš/: *اسم.* پەخش: ١. بڵاوەیی؛ پژاوەیی؛ پژیاوی؛ کار یان ڕەوتی: *الف)* بڵاو بوونەوە یان بڵاو کردنەوە ‹پخش پول: بڵاوەیی پارە› *ب)* گەیاندنی شتومەک بە دەستی فرۆشەر یان کڕیار ‹پخش کالا: بڵاوکردنەوەی شتومەک› *ج)* بڵاو کردنەوەی دەنگ یان ڕەنگ ‹پخش برنامە: بڵاوکردنەوەی بەرنامە› ٢. ئامرازی بڵاوکردنەوەی دەنگی تۆمارکراو.

**پخش**[2]: *صفت.* ١. پرژ و بڵاو؛ پەلاف؛ پژگیا؛ پژیاگ؛ پژیاو؛ توچ ‹پولها روی میز پخش بود: پارەکان لە سەر مێزەکە پرژ و بڵاو بوون› ٢. بڵاو؛ پەخش ‹خبر پخش شدەاست: هەواڵەکە بڵاو بۆتەوە›.

**پخشندگی** / paxšandegî/: *اسم.* پەخشانی؛ پەخشاندەیی؛ پەخشێنەیی؛ لێ‌هاتوویی ماکێک بۆ بڵاوکردنەوەی تراو یان تیشکێک کە لە هەر لاوە لێی دەدا.

**پخش و پلا** / paxš-o-palā/: *صفت.* *[گفتاری]* پرژ و بڵاو؛ پرش و بڵاو؛ پەرش و بڵاو؛ پژگیا؛ وەشاو؛ بڵاوەبوو بە شێوەی ناڕێک‌وپێک ‹کتابها روی میز پخش و پلا بود: کتێبەکان لە بان مێزەکەوە پرژ و بڵاو بوون›.

**پخکاری** / paxkārî/ ☜ **پخزنی**

**پخمگی** / paxmegî/: *اسم.* گێلی؛ هەپەیی؛ سەپۆلی؛ ساویلکەیی؛ پەخمەیی ‹آدم بە این پخمگی ندیدە بودم: مرۆی بەم گێلیەم نەدیبوو›.

**پخمه** / paxme، ـها/: *صفت.* *[گفتاری]* گێل؛ گێلۆکە؛ دەبەنگ؛ ساویلکە؛ سەپۆل؛ حەپۆل؛ پەخمە؛ سەپەل؛ چۆپیک.

**پدافند** / padāfand، ـها/: *اسم.* بەرەوانی؛ بەرەڤانی؛ بەرگری.

**پدافندی** / padāfandî/: *صفت.* بەرەوان؛ بەرەڤان؛ سەبارەت بە بەرگری.

**پداگوژی** / pedāgojî/: [فرانسوی] *اسم.* زانستی ڕاهێنانی مندالان.

**پدال** / pedāl، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* پایدەر ‹پدال گاز: پایدەری گاز›.

**پدر** / pedar، ـها؛ ـان/: *اسم.* باوک؛ بەوک؛ باب؛ تاتە؛ باوگ؛ باڤ؛ باوا؛ ئۆباڤ؛ کاڵو؛ تاتۆ؛ بابۆ؛ تات: ١. گیانلەبەری نێر (بەتایبەت مرۆ) کە زارۆی ڕۆهێناوە ‹پدر آزاد بیمار است: باوکی ئازاد نەخۆشە› ٢. *[مجازی]* بنیاتنەر و دامەزرێنەری شتێکی تازە ‹پدر

تاریخ؛ پدر برق: باوکی مێژوو؛ باوکی کارەبا› ٣. مامە؛ وتەی ڕێز لێنان و دلۆڤانی بۆ پیاوانی بەساڵاچوو ‹پدر! بفرمایید بنشینید: باوکە! فەرموو دانیشە›.

▣ پدر روحانی: باوکی ڕۆحانی: ١. ئەو کەسە کە ڕاهێنانی ڕەوانی کەسێکیتری وە ئەستۆگرتووە ٢. نازناوێکی بە ڕێز و قەدرە بۆ بانگکردنی پیاوانی ڕۆحانی لە کلێسەدا: **پدر مقدس**

**پدر مقدس** ☜ **پدرروحانی ـ٢**

**پدر ناتنی:** باوەپیارە؛ زڕباب.

▣ **پدر درآوردن:** *[کنایی]* ڕۆحدەرهێنان؛ ڕیشە/ جەرگ دەرهێنان؛ کارێکی زۆر سەخت و دژوار کە دەبێتە هۆی ئازاری زۆر ‹کارگری این قدر سخت است کە پدر آدم را درمیآورد: کرێکاری ئەوەندە دژوارە کە ڕوحی مرو دەردێنیت›.

**پدر شدن:** بوونە باوک (بۆ پیاوێ دەگوترێ کە دەبێتە خاوەنی منداڵ).

**پدرآمرزیده** / pedarāmorzîde، هـا/: *صفت.* باوکباش؛ بابچاک؛ تاتەخاس؛ ڕەحمەتی؛ چەشنێ وتەی بانگکردنە لەگەڵ گلەییدا ‹پدرامرزیده، چه دل خوشی داری!: باوکباش، چ دڵێکی خۆشت هەیە!›.

**پدراندر** / pedar'andar، هـا/: *اسم.* باوەپیارە؛ زڕباب؛ ناباوک؛ باوک بەدەر؛ باب هەڵەک.

**پدرانه**[1] / pedarāne/: *صفت.* *[مجازی]* باوکانە؛ تاتەیانە؛ باوکی؛ بابینی؛ باوینی؛ باڤینی؛ زۆر دلۆڤان ‹لبخند پدرانه: پێکەنینی باوکانە›.

**پدرانه**[2]: *قید.* باوکانە؛ باوکیەتی؛ وەکوو باب ‹او پدرانه رفتار کرد: باوکانە دەجووڵایەوە›.

**پدربزرگ** / pedarbozorg، هـا؛ ـان/: *اسم.* باوا؛ بابا؛ باواگەورە؛ باوگباوگ؛ بابەگەورە؛ باپیر؛ کالک؛ باوکی باوک یان باوکی دایک.

**پدرجد** / pedarcad(d)، هـا/: [فارسی/ عربی] *اسم.* کاڵ؛ باپیر؛ باواگەورە؛ باوکی باوا.

**پدرخوانده** / pedarxānde، هـا/: *اسم.* ١. تاتە؛ مێردی تایەن؛ زرفە زۆر؛ زڕبابی ژن یان مێرد ٢. پیاوێک کە کچ یان کوڕێکی وەک منداڵی خۆی وەرگرتووە.

**پدردار** / pedardār، هـا/: *صفت.* باوکدار؛ خاوەن باوک.

**پدرزن** / pedarzan، هـا/: *اسم.* خەزوور؛ خەزوورە؛ هەسوورە؛ بابی ئافرەتی مێرد.

**پدرسالار** / pedarsālār، هـا/: *اسم.* *[جامعەشناسی]* میرباب؛ بابساڵار؛ سەرۆکی خێڵ.

**پدرسالاری** / pedarsālārî، هـا/: *اسم.* *[جامعەشناسی]* میربابی؛ بابساڵاری؛ دەزگا کۆمەڵایەتیەک کە تێیدا باوک سەر و سەرۆکی خێزانە و خاوەن دەسەڵاتی ئافرەت و زارۆکانە، هەروەها منداڵ و بنەماڵە بەو دەگەڕێنەوە و تێیدا بەرپرسی و پێشوایی کۆمەڵگا بە مێردانە.

**پدرسوختگی** / pedarsûxtegî، هـا/: *اسم.* *[مجازی]* بابخەرایی؛ ناپیاوی؛ ناپیایی؛ ناپیاگی؛ کار یان ڕەفتاری ناڕەوا.

**پدرسوخته** / pedarsûxte، هـا/: *صفت.* *[مجازی]* ١. نادرووس؛ ناپیاو؛ دەغەڵ؛ دەغوڵ؛ ناڕێک ٢. قەحبەباب؛ جنێوێکە.

**پدرشوهر** / pedaršowhar, -šo:har، هـا/: *اسم.* خەزوور؛ خەزوورە؛ هەسوورە؛ هوسوورە؛ هوسیرە؛ حەسیرۆ؛ باوکی مێرد یان ژن.

**پدرکشتگی** / pedarkoštegî، هـا/: *اسم.* *[مجازی]* کۆنەقین؛ دوژمنایەتی کۆن.

**پدرمرده** / pedarmorde، هـا/: *اسم.* ١. بابمردوو؛ باوکمردوو؛ بێباڤ؛ بێباوک؛ سێوی؛ هەتیو؛ هەتیم ٢. *[کنایی]* بەدبەخت؛

بێئەنوا؛ بێپەنا؛ کلۆل.
پدروار / pedarvār/: *قید.* باوکانە؛ باوکئاسا؛ وەک باوک.
پدرومادردار / pedar-o-mādardār/: *صفت.* دایکوباوکدار؛ بەدایکوباوک: ١. خاوەن کەسایەتی و پلە و ڕێزی بەرز ٢. باوکدار؛ حیسابی؛ بەویست و چاوتێرکەر.
پدری¹ / pedarî/: *اسم.* باوکی؛ بابی؛ تاتەیی؛ باقی: ١. بار و دۆخ یان چۆنیەتی باوک بوون ‹خدا از پدری کمتان نکند: خوا لە باوکی کەمتان نەکا› ٢. *[مجازی]* باوکیەتی؛ باوکایەتی؛ باوکی؛ چاکی و بەزەیی باوکانە ‹آن مرد در حق من پدری کرد: ئەو پیاوە لە ئاستی مندا باوکایەتی کرد›.
پدری²: *صفت.* باوکی؛ پێوەندیدار یان بەستراو بە ماڵی باوکەوە ‹خانوادەی پدری: بنەماڵەی باوکی›.
پدریار / pedaryār، ـها؛ ـان/: *اسم.* جێباب؛ لەجێ باوک؛ پیاوێ کە خەرجی ڕاگرتن و بەخێوکردنی منداڵێک ئەگرێتە ئەستۆ. هەروەها: **مادریار**
پدید¹ / padîd/: *اسم. [ادبی، قدیمی]* ئاشکرا؛ خویا؛ دیار؛ بەرچاو؛ وەرەچەم؛ بەدی؛ دیاردی؛ دۆخ و چۆنیەتی ئاشکرا بوون و بەدیار هاتن یان ڕسکان ‹چون پدید گشت، همە خرسند شدند: کە دەرکەوت، هەموو گەشانەوە›.
▣ پدید آمدن: ئاشکرا بوون؛ دەرکەوتن؛ بەدیهاتن؛ پەیا بوون؛ دیار دان؛ دیاری دان؛ خویا بوون؛ دەرهاتن؛ بەرئامەی؛ پەیدا بیەی ‹آنجا چشمەای پدید آمد: لەوێ چاوکەیەک دەرکەوت›.
پدید آوردن: بەدیهێنان؛ وەدیهێنان؛ ڕەخساندن؛ پێکهێنان.
پدید²: *صفت. [ادبی]* خویا؛ دیار؛ بەرچاو؛ ئاشکار؛ ئاشکرا ‹هیچ روشنی پدید نبود: وسەیەک دیار نەبوو›.
پدیدار / padîdār/: *صفت. [ادبی]* دەرکەوتە؛ وەدیار؛ بەدیار؛ دیار؛ خوانە؛ ئاشکرا؛ ئاشکار؛ پەیار؛ خویا؛ خۆیا؛ بەرچاو؛ وەرەچەم؛ ڕوون ‹شب گذشت و روز پدیدار شد: شەو تێپەڕی و ڕۆژ دەرکەوت›.
▣ پدیدار شدن: بەرچاوهاتن؛ هەڵپشکووتن؛ هەڵقونیان.
پدیدارشناسی / padîdāršenāsî/ ☜ **پدیدەشناسی**
پدیدآورنده / padîdāvarande، ـها؛ ـگان/: *اسم.* ئافرێنەر؛ بەدیهێنەر؛ وەدیهێنەر؛ پێکهێنەر؛ خولقێنەر.
پدیده / padîde/: *اسم.* دیاردە؛ دیاردی؛ بەرچاوە: ١. ئەوەی کە دەبیندرێ یان هەستی پێ دەکرێ ٢. ڕووداو؛ نۆرسک؛ دابی تازە؛ شتی تازە پێکهاتوو.
▣ پدیدەی اجتماعی: دیاردەی کۆمەلایەتی. هەروەها: **پدیدەی اقتصادی؛ پدیدەی شیمیایی؛ پدیدەی فرهنگی؛ پدیدەی فیزیکی**
پدیدەی شکست نور ☜ شکست نور، **شکست**
پدیدەی فای: دیاردەی فای؛ هەڵەی چاو، بەشێوەیەک کە ئەگەر شتێک (وەک تیشک یان فیلم) دوابەدوای یەک و بە مەودای زۆر کەمەوە نیشان بدرێن، چاو ناتوانێ مەودای نێوانیان دیاری بکات.
پدیدەشناسی / padîdešenāsî/: *اسم.* دیاردەناسی: ١. لێکۆڵینەوە لە چۆنیەتی هەڵدانی هزری مرۆڤ وەک پێشەکیەک بۆ چوونە ناو باسی فەلسەفەوە ٢. ڕێزکردنی تاقمێک لە دیاردەگەل لە باری چۆنیەتیانەوە * **پدیدارشناسی**

**-پذیر / pazîr**/: *پیواژه.* -گر؛ -پەزیر؛ -پەزێر؛ -گێر ‹فرمان‌پذیر: فرمان‌کر›.

**پذیرا / pazîrā**/: *صفت.* پەزێرا؛ پەژیرا؛ قبووڵکەر: ١. ئامادە و تەیار بۆ پەزێران پذیرا بودن: پەزیرا بوون› ٢. پەژیران‌کەر؛ میوانداری ‹او بە گرمی پذیرای ما شد: زۆر گەرم و گوڕ میوانداری کردین›.

▣ **پذیراشدن**: قبووڵ‌کردن؛ وە ئەستۆ گرتن. هەروەها: **پذیرا بودن**

**پذیرانە / pazîrāne**، ـها/: *اسم.* وەرگرانە؛ پارەیەک کە بۆ پەزێران لە شوێنێک (وەکوو نەخۆشخانە و زانستگا) لە داواکار دەسێندرێ.

**پذیرائی / pazîrā' î**/ ☜ **پذیرایی**

**پذیرایی / pazîrāyî**، ـها/: *اسم.* پەژیرایی؛ پەزێرایی: ١. ڕاژەکاری؛ میوانداری؛ خزمەتی میوان؛ کار یان ڕەوتی میوان ڕاگرتن؛ میهمان خودان‌کردن؛ پەزیرایی کردن لە میوان ٢. *[گفتاری]* میوانخانە؛ مێمانخانە؛ هۆدەی پەژیرایی؛ ژووری تایبەت بە میوان * **پذیرائی**

**پذیرش / pazîreš**/: *اسم.* پەزێران: ١. کار یان ڕەوتی وەرگرتن؛ پەزێران ‹پذیرش دانشجو: وەرگرتنی خوێندکار› ٢. /ـها/ وەرگری؛ بەشێک لە ڕێکخراوەیەک کە کاری وەرگرتنی بە ئەستۆیە ‹ادارەی پذیرش: مەزرینگەی وەرگری› ٣. /ـها/ پێناسە؛ بەڵگەیەک کە قەبووڵ بوونی کەسێک بۆ کارێک یان شوێنێک نیشان دەدا ‹برای سفیر آلمان تقاضای پذیرش شد: بۆ باڵوێزی ئاڵمان داوای پێناسە کرا›.

**پذیرفتن / pazîroftan**/: *مصدر. متعدی.* //**پذیرفتی**: پەزێرات؛ **می‌پذیری**: دەپەزێری؛ **بپذیر**: بپەزیرە// پەزێران؛ پەژرین؛ پەژیران؛ وەخۆ گرتن؛ قەبووڵ‌کردن: ١. دانان بە ڕاست یان بەجێ بوونی کار یان قسەی کەسێکدا ‹پذیرفتن ادعای شاهد: پەزیرانی قسەی گەوا› ٢. ڕێدانی کەس یان شتێک بۆ چوونە ژوورەوە لە شوێنێکدا ‹پذیرفتن دانشجویان خارجی: پەزیرانی خوێندکارانی لاوەکی› ٣. هاوڕیەتی‌کردن دەگەڵ ویست یان کاری کەسێکدا ‹پذیرفتن تقاضای ارباب‌رجوع: پەزیرانی داخوازی کارێنەران›. هەروەها: **پذیرفتنی**

■ صفت فاعلی: **پذیرندە** (ـ)/ صفت مفعولی: **پذیرفتە** (پەزێراو)/ مصدر منفی: **نَپذیرفتن** (نەپەزێران)

**پذیرفتە / pazîrofte**/: *صفت.* ڕەوا؛ قەبووڵ؛ شایستە؛ لەبار؛ شایەن؛ پەژیراو؛ پەزێراو.

**پذیرە / pazîre**/: *اسم. [اقتصاد]* پەژیرە؛ پەزیرە؛ بەڵێنی کڕینی پەڕەگەلی بایەخدار لە لایەن کڕیارەوە.

**پذیرەنویسی / pazîrenevîsî**، ـها/: *اسم.* کڕێیاری؛ باربوو؛ پەزێرەنووسی.

**پر / par**، ـها/: *اسم.* ١. پەڕ؛ پەل؛ تووک؛ کوڵکە؛ لەش داپۆشی مەل ‹پر پرندە: پەڕی پەلەوەر› ٢. *[مجازی]* باڵ؛ پەل ‹انگار پر درآورد و پرید: وەک بێژی باڵی دەرهێنا و فڕی› ٣. *[گفتاری]* پەڕە؛ بەشێ لە شتێکی سووک و ناسک ‹پر کاه؛ پر کاغذ: بەرد کا؛ پەرد کاغەز› ٤. پەڕە؛ چارەوەز؛ بەشێک لە میوەی بڕێک داران کە بەهۆی پەڕەیەکی ناسکەوە لە بەشگەلی‌تری جیا بووەتەوە ‹پر انار؛ پر سیر: چارەوەزی هەنار؛ سەری سیر› ٥. *[گفتاری]* پەڕ؛ پاژی دوایی شتانی پارچەئاسا ‹پر شال: پەڕی شاڵ›.

▣ پر تاووسی ☜ **پرتاووسی**

▣ پر درآوردن: ١. تووک‌کردن؛ تووک دەرکردن؛ پەلێ زنیەی ‹جوجە پر درآوردە است: جووجەلە تووکی کردووە› ٢. *[مجازی]*

بـاڵ‌گرتنـه‌وه؛ زۆر خۆشـحاڵ بـوون ‹آزاد از خوشحالی داشت پر درمی‌آورد: ئازاد لـه خۆشـیا خه‌ریک بوو باڵ بگریته‌وه›.

پـر ریختـن: تـووک ڕژیـان؛ تـووک‌رزیـان؛ تووک وه‌رین؛ په‌ڕ وه‌رین؛ پـه‌ڵـێ ڕووتیـه‌یـوه ‹پرهـای جوجـه ریختـه: تـووکی جووجـه‌ڵـه‌کـه وه‌ریوه›.

پـر زدن/کـشیدن/گـرفتن: *[گفتـاری]* فـڕین؛ بـاڵ‌لێدان؛ باڵـدان؛ دان لـه شـه‌قـه‌ی بـاڵ؛ باڵ‌گرتن؛ باڵ‌گرتنـه‌وه؛ باڵـێ‌گێرتـه‌ی ‹کـلاغ پر زد و رفت: قاڵاوه‌که فڕی و ڕۆی›.

پـر کنـدن: ١. قوشـقن‌کـردن؛ تـووک کـه‌نـدن؛ زه‌متانـدن؛ ئـه‌وه‌ڕووتنـه‌ی؛ پـه‌ل کـه‌نتـه‌ی ‹پرکنـدن مُـرغ کـار سـختی اسـت: قوسـقن‌کـردنی مریـشک کـارێکی دژواره› ٢.

☜ پر- پر زدن، **پر-پر**

پر[1] / por/: *صفت.* پڕ؛ نـژن؛ لـپ؛ لیـپ؛ لیپـان؛ سه‌رپڕ؛ سـه‌رڕێـژ؛ چڕ؛ چـوڕ؛ متـرۆس؛ لـیڤ؛ هه‌بـل؛ پـه‌ڕ؛ تـه‌ژی: ١. گـۆزان؛ دارمـاڵ؛ تـژه؛ لـه‌م؛ تـژی؛ ئـاره‌ی؛ بـێ بۆشـایی ‹ظـرف پـر: ده‌فـری پـڕ› ٢. داگرتـوو؛ داگـری؛ درگـاخن؛ تێـر؛ ده‌سـرێژ؛ بـێ جێگـه‌ی زیـایی بـۆ شـتێکی‌تـر ‹اتـاق پـر: هـۆده‌ی پـڕ› ٣. *[مجـازی]* خاوه‌ن زانـست و ئـه‌زمـوونی زۆر ‹اسـتاد مـا مـرد پری بود: مامۆستاکه‌مان پیاوێکی پڕ بوو›.

◘ پـر شـدن: ١. پـڕ بـوون؛ لـڕپ بـوون؛ قه‌لاپـه‌چـن بـوون؛ پـووڕاو بـوون؛ زیپاوزیـپ بوون؛ نـژنین؛ پـه‌ڕ بیـه‌ی ‹اتـاق پـر شـد از آب: هۆده‌که پڕ بوو له ئـاو› ٢. قـاڵ داکـه‌وتـن؛ لـه هه‌موولا بلاو بوونـه‌وه ‹تـوی شـهر پـر شـده بـود که زلزله مـی‌آیـد: لـه نـاو شـاردا قـاڵ داکـه‌وتبـوو که بوومه‌له‌رزه دێت›.

پـر کـردن: ١. پڕکـردن؛ پـڕه‌وه‌کـردن؛ کپـانن؛ پـه‌ڕکـه‌رده‌ی ‹شیـشه را پـرکن: شووشه‌که پڕکـه› ٢. قـوو داخـستن ‹رفتـه بـود همه جا پـر کـرده بـود شیرین دارد شوهر مـی‌کنـد: ڕۆیـشتبوو قـووی داخـستبوو شـیرین ده‌یـه‌وێ مێـرد بکـا› ٣. *[مجـازی]* پـڕه‌وه‌کـردن؛ دنـه‌دان؛ هـان‌دان؛ هـه‌ڵـخڕاندن ‹او را حسابی پر کرده بودند: ئـه‌ویـان تـه‌واو پـڕ کردبـووه‌وه› ٤. پـڕه‌وکـردن؛ تۆمـارکردنی ده‌نـگ یـان فـیلم لـه سـه‌ر شـریت ‹نـوار پـر کـردن: شـریت پـڕه‌و کـردن› ٥. پڕکردنـه‌وه؛ پـه‌ڕه‌وه‌کـه‌رده‌ی؛ داپۆشـان یـان پـڕه‌وکـردنی کـونی ددان ‹پـر کـردن دنـدان: پڕکردنـه‌وه‌ی ددان› ٦. پـڕکردن؛ پڕکردنـه‌وه؛ ڕژانـدنی مـاکێکی دیاریکراو له نێو ده‌فرێکـدا ‹پر کـردن کپسول گاز: پڕکردنـی که‌پسوولی گاز›.

پـر[2]: *قیـد.* *[گفتـاری]* زۆر؛ فـره؛ پـڕ؛ پـه‌ڕ ‹پُـر بـد نیست: زوریش خراپ نیه›.

پر-[3]: *پیشوازه.* پڕ-؛ پـه‌ڕ-؛ بـه چـه‌نـدێتی یـان چۆنیـه‌تی زۆره‌وه ‹پرآب: پڕئاو›.

پراتیـک / p(e)rātîk/: [فرانـسوی] *اسـم.* کـرده‌وه؛ کـرده؛ کـه‌رده: ١. کـار ‹نظریـه یـک چیـز اسـت و پراتیـک چیـز دیگـر: بیرۆکـه شـتێکه و کـرده‌وه شـتێکی دی› ٢. کـارزانی؛ کارامـه‌یی؛ ئـه‌زمـوونی کـرده‌وه‌یـی ‹معلومـاتش زیـاد نیـست ولـی پراتیـک خـوبی دارد: زانـستی زۆر نیـه بـه‌لام کارزانی باشه›.

پراتیکـی / p(e)rātîkî/: [فرانـسوی] *صـفت.* ئـه‌زموونی؛ کـرده‌یـی؛ کـرده‌وه‌یـی؛ کـه‌رده‌یـی ‹دندانساز پراتیکی: ددانسازی ئه‌زموونی›.

پراسـه‌ئودیمیم / p(e)rāse'odîmiyom/: [انگلیـسی] *اسـم.* پراسـێئۆدیمیۆم؛ تـوخمی کیمیـایی کـانزایی ده‌گمـه‌ن لـه ده‌سـته‌ی لانتانیده‌کـان بـه ژمـاره ئـه‌تـومی ٥٩ و کێـشی ئـه‌تـومی ١٤٠,٩٠، سـپی ئامـاڵ زه‌رده کـه بـۆ دروست‌کردنی شیشه‌ی ڕه‌نگی به‌کار دێ.

پـراش / parāš/: *اسـم.* *[فیزیـک]* پـریش؛ دیـارده‌ی بـلاو بوونـه‌وه‌ی شـه‌پۆل (تیـشک،

دەنگ و...) لە کاتی بواردنیان لە شتێکەوە.

**پراکریت** / p(e)rākrît/: *اسم.* پراکریت: ١. هەرکام لە زمانە نوێیە هێندیەکان کە سەرچاوەی هیندو ئورووپاییان هەیە ٢. زمانە کۆنەکانی هیند بێجگە لە سانسکریت.

**پراکندگی** / parākandegî، ـها/: *اسم.* بڵاوەیی؛ پەراکەندەیی؛ تیچی؛ تیچانی؛ ولاوی؛ بڵاوی؛ وەلایی؛ پرژ و بڵاوی؛ پەرژ و بڵاوی؛ شەپلینی ‹پراکندگی جمعیت: بڵاوەیی ئاپۆرە›.

**پراکندن** / parākandan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **پراکندی**: بڵاوت کرد؛ **می پراکنی**: بڵاو دەکەی؛ **بپراکن**: بڵاو بکەوە// پەرەواوتن؛ پەرەواندن؛ بژیاندن؛ پژاندن؛ بڵاوکردن؛ پەرەوکردن؛ پەرزیون؛ پرژاندن؛ بژکین؛ ڤەبژکاندن؛ تیچاندن؛ ولاونەی؛ دەراندن: ١. ڕاپساندن؛ جیاوەکردن؛ دوورکردنەوە؛ دوور خستنەوە؛ ئاوپەرەکردن؛ ئاوپەرە تێخستن؛ یەکپارچەیی و ڕێکوپێکی کۆمەڵەیەک تێکدان و ئەندامەکانی لێک جیا و دوور خستنەوە ٢. بڵاوەکردن؛ پەخشەوکردن؛ وەلا و ڕەواج دان. هەروەها: **پراکندنی**

■ صفت فاعلی: **پراکننده** (بڵاوەکەر)/ صفت مفعولی: **پراکنده** (بڵاوەکراو)/ مصدر منفی: **نَپراکندن** (بلاو نەکردنەوە)

**پراکنده** / parākande/: *صفت.* پرژ؛ بڵاو؛ بەرژ؛ پرش؛ گژۆلە؛ پرژ و بڵاو؛ وەلاو؛ بەلاڤ؛ پرژ؛ پەرژ؛ هاویر؛ لێکجیا؛ پەرشە؛ ولا؛ باڵ ـ باڵ؛ تەرت؛ پەخش؛ جوێر؛ جیا ـ جیا؛ پەراکەندە؛ پەراوە؛ پەرتەواز؛ پەرتەوازە: ١. شپرز؛ شپرزە؛ شەپرزە؛ شپرێو؛ شەپل؛ شەرپەزە ‹کارهای پراکنده: کارگەلی پرژوبڵاو› ٢. شپرزە؛ شپرز؛ شەپرزە؛ شپرێو؛ شەپل؛ شەرپەزە؛ لێکپساو و کەلا لە پەیوەند ‹جملەهای پراکندە: ڕستەگەلی سەرزە› ٣. دەراندە؛ شاش؛ تەنک؛ نەچڕ و نەپڕ ‹درختان پراکندە: دارگەلی دەراندە›.

▣ **پراکنده شدن**: بڵاوەکردن؛ چۆپڕیان؛ بڵاو بوون؛ پەرژان؛ داپژان؛ ڤەبژکان؛ ڤەبژکین؛ ڤەبژکیان؛ ڕاورتن؛ لێکبڵاو بوون؛ پرژ و بڵاو بوون؛ ئاوپەرەکەوتن؛ ئاوپەرە بوون؛ ولاویەی ‹پس از مدتی مردم پراکنده شدند: دوای ماوەیەک خەڵک بڵاوەیان کرد›.

**پراکنده کردن**: بڵاوە پێکردن؛ پەرەواندن؛ دەراندن؛ ولاونەی ‹نیروی نظامی مردم را پراکنده کرد: هێزی چەکداری خەڵکیان بڵاوەیی کرد›.

**پراکندەکاری** / parākandekārî، ـها/: *اسم.* پەرتوپەلاوکاری؛ شپرزەکاری؛ شپرێوکاری؛ پەرشەکاری؛ کار یان ڕەوتی ئەنجامدانی کاری جۆراوجۆر، بە بێ ئامانجێکی دیاریکراو ‹از این پراکندەکاری دست بردار و بچسب بە یک کار بخصوص: دەس لەم پەرت و پەلاکاریە هەڵگرە و خەریکی کارێکی تایبەت بە›.

**پراکندەگویی** / parākandegûyî، ـها/: *اسم.* هاتەران ـ پاتەرانبێژی؛ پەرت و پەلا بێژی؛ بەرەڵدابێژی؛ پەرێشانبێژی؛ وێڵ واچی ‹سمینارهای ما عبارت است از یک مشت پراکندەگویی: کۆبوونەوەکانمان بریتین لە هێندێک پەرتوپەلابێژی›.

**پراگماتیسم** / p(e)rāgmātîsm/: [فرانسوی] *اسم.* کردەوەخوازی؛ کردەخوازی؛ بیرێکی فەلسەفیە کە دەڵێ واتاکان دەبێ لەنێو ئاسەوارەکانیاندا بدۆزرێنەوە. ئەرکی بیر، ڕێبەری کردەوەیە و لێکۆڵینەوە لە دروستی بڕوایەک، دەبێ لە چۆنیەتی ئاسەوارەکانیدا بەدی بکرێ.

**پراگماتیک** / p(e)rāgmātîk/: [فرانسوی]

صفت. کرداری؛ سەبارەت بە کردەخوازی.

**پران / parrān/**: *صفت.* فڕۆک؛ فڕندە؛ بە توانای باڵگرتنەوەوە.

**پرانتز / parāntez, p(e)rāntez، ـها/**: [فرانسوی]/*اسم.* کەوان؛ کەوانە؛ کەوشە؛ دوو خەتۆکەی کەوانی بەرامبەر بە یەک: () کە بۆ ڕوونکردنەوەی مەبەست یان ڕستەیەک بەکاردێ و زیاتر چەند وشەیەکی تێدا دەنووسن.

▣ پرانتز باز کردن: کەوانەکردنەوە: ١. کێشانی ئەم نیشانە: ( لە نووسراوەدا ٢. *[کنایی]* وتنی ڕستەیەکی ڕوونکەرەوە لە نێوان قسەدا.

پرانتز را بستن: کەوانە بەستن؛ کێشانی ئەم نیشانە: ) لە نووسراوەدا.

**پراندن / parāndan/**: *مصدر. متعدی.* //**پراندی**: فراندت؛ **می پرانی**: دەفڕێنی؛ **بپران**: بفڕێنە// ١. هەڵفڕاندن؛ فڕاندن؛ باڵداین؛ هەڵساندن؛ پەڕاندن؛ فڕنەی؛ فڕنای ‹کبوتر پراندن: کۆتر هەڵفراندن› ٢. هاویشتن؛ هاویژتن؛ فڕێدان؛ ئاویتن؛ شەمراندن؛ فڕەدەی؛ تووڕدان؛ برنگدان؛ برکدان؛ تفوون؛ خستن؛ وسەی؛ شەی ‹سنگ پراندن: بەرد هاویشتن› ٣. *[مجازی]* زڕاندن؛ فڕاندن؛ وازڕکردن ‹مشتری را پراندن: مشتەری زڕاندن› ٤. *[گفتاری]* قسە فڕێدان؛ قسە پەڕاندن؛ هاکۆ وتن؛ وتنی قسەیەک بە بێ بیر لێکردنەوە ‹حرفی پراندن: قسەیەک فڕێدان›. هەروەها: **پراندنی**

■ **صفت مفعولی: پرانده** (هەڵفڕێنراو)/ **مصدر منفی: نَپراندن** (هەڵنەفڕاندن)

**پرانە / parrāne، ـها/**: *اسم.* قیژەک؛ مووشەک.

**ـپرانی / parānî، ـها/**: *پیوازە.* ١. ـ فڕێنی؛ هەڵفڕاندن؛ فڕاندن؛ پەڕاندن ‹کبوترپرانی: کۆترفڕێنی› ٢. ـهاوێژی؛ هاویشتن؛ خستن؛ شانەی؛ وەشاندن ‹جفتکپرانی: جووتەهاوێژی›.

**پربار / porbār/**: *صفت.* بەدەسکەوت؛ پڕبار؛ پڕسەمەر؛ بەبەر؛ نەخلەش؛ نەخلیاش ‹سفر پرباری داشتند: سەفەرێکی بەدەسکەوتیان هەبوو›.

**پرـپر / parpar/**: *صفت.* ١. هەڵوەریو ٢. پەڕەـپەڕە (بۆ کتێب و دەفتەر).

▣ **پرـپر زدن**: *[مجازی]* ١. هەڵقرچان؛ توانەوە؛ هەڵوەزنینەوە و هەڵپێچان لە دەرد و ژان ‹طفلک پرـپر میزد: فەقیره هەڵدەقرچا› ٢. زۆر بەتاسەوە بوون ‹دلم برایش پرپر میزند: دڵم بۆی زۆر بەتاسەیە›.

پرـپر شدن: ١. هەڵوەرین؛ هەڵوەران؛ داوەرین؛ ئەرەڕێزەی؛ دانەدانە داکەوتنی پەلکی گوڵ ‹گُلها از بیآبی پرـپر شدند: گوڵەکان لەبەر بێئاوی هەڵوەران› ٢. پەڕەـپەڕە بوون؛ هەڵپسانی شیرازەی کتێب ‹ورقهای کتاب پرـپر شدند: لاپەڕەکانی کتێبەکە پەرەـپەرە بوونەوە› ٣. *[مجازی]* هەڵوەرین؛ مردن؛ سارد بوونەوە؛ سپی بوونەوە ‹بچەاش جلو چشمش پرـپر شد: مندالەکەی لە بەر چاویەوە هەڵوەری›.

هەروەها: **پرـپر کردن**

**پرپر / porpar/**: *صفت.* پڕپەڕ؛ پڕپەڕە؛ بە پەڕەی زۆرەوە.

**پرپری / perperî/**: *صفت. [گفتاری]* ناسکۆڵە؛ تەنکەڵە؛ تەنک و تیواڵ؛ تەنک و تیوڵ؛ نەرم و ناسک (وەک پەڕی پیواز).

**پرپشت / porpošt/**: *صفت.* پڕ؛ پەڕ؛ چڕوپڕ؛ پڕپشت ‹موی پرپشت: مووی پڕ›.

**پرت / part/**: *صفت. [گفتاری]* پەرت: ١. هاڤێ؛ تەرک؛ برنگ؛ برک؛ برگ؛ دوورەدەست ‹جای پرت: شوێنی پەرت› ٢.

وەشن؛ دوور لە مەبەست ‹حرف پرت: قسەی پەرت›.

⊡ **پرت بودن**: تەریک بوون؛ پەرت بوون؛ دوورەدەس بوون ‹خانەاش جای پرتی بود: ماڵەکەی لە شوێنێکی تەریکدا بوو›.

**پرت شدن**: ١. داکەوتن؛ بەر بوونەوە؛ گلان؛ هەڵدێران؛ وەر بیەی؛ کەوتەیرە؛ لە جێگایەکی بەرزەوە کەوتنە خوارەوە ‹از کوە پرت شد: لە کێو داکەوت› ٢. فڕە بەستن؛ پەرت بەستن؛ بڕک بەستن؛ خسیان؛ خریان؛ پڕتافیەی ‹سنگ پرت شد و خورد بە در: بەردەکە پەرتی بەست و دای لە دەرکەکە›.

**پرت کردن**: هاویشتن؛ هاویتن؛ هاڤیتن؛ فڕێدان؛ فڕدان؛ فڕداین؛ شەمڕاندن؛ تووڕدان؛ هەڵداشتن؛ فڕکدان؛ فڕەدەی؛ بڕکدان؛ برنگدان؛ خستن؛ وسەی؛ شەی؛ شانەی؛ گلاندن ‹بە طرفم سنگی پرت کرد: بەردێکی بۆم هاویشت›.

**پرت گفتن**: پەرتوپەلا گوتن؛ هەلیت و پەلیتگوتن؛ هاتەران–پاتەرانگوتن؛ بێ سەر و بەر قسەکردن؛ قسە تووڕدان؛ وتە بەردان ‹پرت نگو! چنین چیزی ممکن نیست: هاتەران-پاتەران مەڵێ! شتی وا نابێ›.

**پرت** / pert/: *اسم.* پەرتاوتە؛ ئەو شتانە کە دەرێژرێن، نەخوازا لە کار و بەرهەمگەلی پیشەسازیدا.

⊡ **پرت داشتن**: بە پەرتاوتە بوون ‹این کاغذ مناسب نیست، خیلی پرت دارد: ئەم کاغەزە باش نیە، زۆر پەرتاوتەی هەیە›.

**پرت رفتن**: پەرتاوتە هێنان؛ فێڕۆ چوون؛ زایە ڕۆیین ‹چرا می‌گذاری پارچە این‌قدر پرت برود؟: بۆ ئەهێڵی پارچەکە ئەم هەموو پەرتاوتە بینێ؟›.

**پرت شدن**: پەرتاوتە بوون؛ زایە بوون ‹موکت را بد بریدی بیشترش پرت شد: لەیەکەت خراو بڕی فرەتری پەرتاوتە بوو›.

**پرتاب** / partāb/: *اسم.* پڕتاف؛ پڕتاو؛ پڵەلتاف؛ کار یان ڕەوتی فڕێدان و هاویشتن و وەڕێخستنی شتێک لەپڕ و بە پڕتاو ‹پرتاب سنگ: پرتافی بەرد›. هەروەها: **پرتاب شدن؛ پرتاب کردن**

**پرتابل** / portābl، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* دەستەلگر؛ بەدەس‌بر؛ تایبەتمەندی شتێک کە بە تاقەکەسێک بگوزرێتەوە ‹تلویزیون پرتابل: تەلەویزیۆنی دەستەلگر›.

**پرتابە** / partābe، ـها/: *اسم.* بەرکی؛ پڕتاوە؛ پڕتافیە؛ ئەو شتەی کە بە هێزێکەوە بۆ پێکدادان بە نیشانەیەکەوە دەخرێ.

**پرتاووسی** [1] / par(e)tāvusî/: [فارسی/ معرب] *اسم.* پەڕتاووسی؛ کەسکەشین؛ کەسکەزەلال؛ ڕەنگی سەوزی ئامال وەنەوش: **پرطاووسی**

**پرتاووسی** [2]: *صفت.* پەڕتاووسی؛ کەسکەشینە؛ بە ڕەنگی سەوزی ئامال بەنەوش: **پرطاووسی**

**پرترە** / portre، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* پورترە؛ وێنە: ١. وێنەی بەدەستکێشراوی کەسێک؛ بەتایبەت لە ڕوومەتی ٢. عەکسی چار و دیمەنی کەسێک.

**پرترەسازی** / portresāzî/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* وێنەهەلگری؛ وێنەکێشی؛ کار یان ڕەوتی کێشان یان هەلکەندنی وێنەی کەسێک. هەروەها: **پرترەساز**

**پرتست** / porotest, p(e)rotest/: [؟] *اسم.* *[نامتداول]* بەرهەلستی؛ ناڕەزایەتی: **پرۆتست**

**پرتستان** / porotestān, p(e)rotestān/: [فرانسوی] *اسم.* پرۆتیستان: ١. ☜ مذهب پرتستان، **مذهب** ٢. /ـها/ هەرکام لە پەیڕەوانی ئایینی پرۆتێستان * **پرۆتستان**

**پرتغالی** / porteqālî/: اسم. پورتەغالی: ١. لە زمانگەلی ڕۆمیایی، باو لە ولاتانی پورتەغاڵ و بریزیلدا ٢. /ـها؛ ـان/ هەرکام لە خەڵکی سەربە ولاتی پورتەغاڵ یان زارۆکانیان.

**پرتقال** / porteqāl, portoqāl، ـها/: اسم. پرتەقاڵ؛ فلتەقان: ١. داری پرتەقاڵ ٢. میوەی پرتەقاڵ.

**پرتقالی** / porteqālî, portoqālî/: صفت. پرتەقاڵی: ١. لە ڕەنگ پرتەقاڵ یان نارنجیڕەنگ. هەروەها: **پرتقالیرنگ** ٢. بە تام و چێژەی پرتەقاڵ ‹بستنی پرتقالی: چلوورەی پرتەقاڵی›.

**پرتکل** / protokol/: [فرانسوی] ☜ **پُرُوتُکُل**

**پرتکلف** / portakallof/: [فارسی/ عربی] صفت. ١. دژوار؛ گرێدار؛ سەخت؛ سەخڵەت ٢. بەشکۆ؛ شکۆدار؛ بەزرقوبەرق.

**پرتگاه** / partgāh، ـها/: اسم. هەڵدێرگا؛ هەڵدێر؛ هەڵدێرکە؛ هەڵەت؛ هاڵ؛ کەور؛ کەن؛ پەرتگە؛ مای؛ دەن؛ یارمە؛ جێگەی زۆر بەرز و ڕژد کە مەترسی بەر بوونەوەی زۆرە.

**پرتو** / partow, parto:، ـها/: اسم. تیشک؛ پریسگە؛ پرشنگ؛ تیش؛ تیژک؛ تیریژ؛ تیرۆژ؛ تیجی: ١. خەت یان تیشکێکی زۆر باریکی ڕووناکی ٢. شەوق؛ ڕۆشنایی؛ ڕووناهی؛ ڕووناکی ‹پرتو آفتاب: تیشکی هەتاو› ٣. تابشت.

▣ **پرتوآفتاب**: تیرۆژ؛ تیریژ؛ تیشکی هەتاو؛ تیشکی ڕۆژ.

**پرتوکیهانی**: تیشکەتیژە؛ تیشکی ئاسمانی؛ تیشکی کیانی.

▣ **پرتو افشاندن**: تیشکدانەوە؛ تیج وەتەیوە.

**پرتو افکندن**: ١. تیشک خستن؛ نوور خستنە سەر شتێک ٢. وریشە دانەوە؛ تیشک دانەوە؛ گرشە دانەوە؛ بەدەور و بەردا نوور و ڕۆشنایی بڵاوکردنەوە.

**پرتو دادن**: ڕووناکی دان؛ ڕۆشنایی دانەوە.

**پرتوافشانی** / partow'afšānî, parto:-، ـها/: اسم. [ادبی] ڕەوتی تیشکدانەوە ‹ماه در آسمان پرتوافشانی می‌کرد: مانگ لە ئاسماندا تیشکی دەدایەوە›.

**پرتوان** / portavān/: صفت. [ادبی] بەهێز؛ بەقەوەت؛ ڕاقوو؛ بەوزە؛ وزەدار؛ توانا ‹دستان پرتوان: دەستانی بەهێز›.

**پرتوبینی** / partowbînî, parto:-، ـها/: اسم. ڕادیۆسکۆپی؛ کار یان ڕەوتی دیتنی لەش بە یارمەتی پرشنگ و تیشک.

**پرت‌وپلا** / part-o-palā، ـها/: اسم. هاتەران‌ـپاتەران؛ پڕ و پووش؛ پەرت‌وبڵاو؛ واش؛ شاش؛ ولش؛ هەڵیت‌وپەڵیت؛ هاش و واش ‹در نامەاش یک مشت پرت‌وپلا نوشتە بود: لە نامەکەیدا هێندێ هاتەران‌ـپاتەرانی نووسیبوو›.

**پرتودرمانی** / partowdarmānî, parto:-، ـها/: اسم. ڕادیۆتراپی؛ تیشک‌دەرمانی؛ کار یان ڕەوتی چارەسەرکردنی نەخۆش بەم شێوە کە ئەندامە ناساقەکەی دەخەنە ژێر تیشکەوە.

**پرتودهی** / partowdehî, parto:-، ـها/: اسم. تیشک‌دەیی: ١. کار یان ڕەوتی تیشک‌دان؛ شۆق‌دان؛ شەوق‌دان؛ تیشکدانی وزەی تاوشتی (وەک نوور و گەرما) ٢. کار یان ڕەوتی تیشک‌لێدان؛ تیشک‌پێدان؛ پرشنگ‌لێدان؛ شەوق‌لێدان؛ دانانی شتێک لەبەر تیشکێکەوە (وەک پرشنگی ئیکس یان گاما).

**پرتوزا** / partowzā, parto:-، ـها/: صفت. تیشکزا؛ تیشکدەر؛ شۆقدەر؛ پرشنگدەر؛

پرشنگدار؛ بە تایبەتمەندی یان هێزی تیشکدانەوەوە؛ ڕادیۆئەکتیف: **رادیواکتیو**

**پرتوزایی** / partowzāyî, parto:- / ھا/: اسم. تیشکدەری؛ تیشکزایی؛ تایبەتمەندی بڕێک لە توخمەکان (وەک ئۆرانیوم) کە لە خۆیانەوە پرشنگی نادیار دەدەنەوە: **رادیواکتیویتە**

**پرتوشناس** / partowšenās, parto:- / ھا؛ ـان/: اسم. تیشکناس؛ پرشنگناس؛ ڕادیۆلۆژیست.

**پرتوشناسی** / partowšenāsî, parto:- / ھا/: اسم. تیشکناسی؛ پرشنگناسی؛ ڕادیۆلۆژی.

**پرتونگاری** / partownegārî, parto:- / ھا/: اسم. ڕادیۆگرافی.

**پرچ** / parč ھا/: اسم. پەچ؛ پەرچ؛ پەچوە؛ پەر؛ جۆرێک بزماری سەرپان بۆ لکاندنی چەند پاژ (وەک ئاسن) پێکەوە.

▣ پرچ کور: پەرچی یەکلا؛ پەچی کوێر؛ جۆرێک پەرچ کە تەنیا لە لایەکەوە ڕێگادەستی هەیە.

پرچ لولەای: پەچی لوولەیی؛ پەرچی لوولەیی؛ جۆرێک پەرچ کە زیاتر بۆ لکاندنی شتی سووک وەک چەرم و مقەبا دەبێ.

▣ پرچ کردن: پەرچکردن؛ پەچکردن؛ پێکەوە نووساندن؛ پێکەوە لکاندن؛ پێکەوە نووساندنی دوو تیکە بە پەرچ. هەروەها: **پرچکاری**

**پرچانگی** / porčānegî ھا/: اسم. وراجی؛ فرەوێژی؛ زۆربلێیی؛ زۆربێژی؛ چەنەدرێژی؛ چناکەدرێژی؛ چەنەوەری؛ کار و ڕەوتی چەناگەدان؛ چەنەلێدان؛ چالتەچەلت کردن ‹آنقدر پرچانگی کرد، نگذاشت بە کارم برسم: ئەوەندە وراجی کرد، نەیهێشت بە کارەکەم ڕابگەم›.

**پرچانه** / porčāne ھا/: صفت. وراج؛ زۆربلێ؛ فرەوێژ؛ چەنەوەر؛ چەنەباز؛ چنروو؛ چەناگەدرێژ؛ زۆربێژ؛ دەڤدرێژ؛ زماندرێژ ‹گیر یک مُشت آدم پرچانه افتاده بودم: ببوومە تووشی چەندکەسێکی وراجەوە›.

**پرچرب** / porčarb /: صفت. *[گفتاری]* زۆر چەور؛ پرچەوری؛ فرە چەور؛ فرە چەرب ‹غذای پرچرب: چێشتی چەور›.

**پرچم** / parčam ھا/: [ترکی]/اسم. ئالا؛ پەرچەم؛ پەرچەمە؛ بەیداخ؛ بەیاخ؛ بەیداغ؛ عالا؛ بەندێر: ١. پارچەی دروشمی گەل و قەوم ‹پرچم ایران: ئالای ئێران› ٢. لەتە پارچەیەک کە بڕێ جار بۆ ئاماژە، وشیاریدان یان هەڕەشە کەلکی لێ وەردەگیرێ ‹پرچم سفید: ئالای سپی› ٣. *[گیاهشناسی]* بەشی نێرینەی گیا ٤. *[مجازی]* پەرچووکە؛ قشت؛ تونچک؛ کرینجک؛ کاکۆڵ؛ کاکول؛ غولامانە؛ بەشێک لە مووی تەوقی سەر.

▣ پرچم سفید: ئالای سپی؛ ئالای چەرمگ؛ پارچەیەکی سپی کە بە نیشانەی کۆڵدان یا ئاشتی هەڵیدەدەن تا شەڕ و تەقە ڕاوەستێ.

**پرچمدار** / parčamdār ھا؛ ـان/: [ترکی/فارسی]/اسم. ئالاهەڵگر: ١. بەیداخدار؛ پەرچەمدار؛ کەسێ کە لە بەر تاقمێکەوە ئالاکەیان هەڵدەگرێ ‹پرچمدار گروه: ئالاهەڵگری کۆمەڵ› ٢. ڕچەشکێن؛ سەرپەل؛ کەسێ کە دەبێتە ناسێنەری ئامانج یان ڕەوتێک ‹پرچمدار صلح: ئالاهەڵگری ئاشتی›.

**پرچین** / parčîn ھا/: اسم. پەرژین؛ پەرچین؛ پەرچ؛ چەپەر؛ چیل؛ جاخ؛ دیواری شوولین؛ ڕیتاڵ؛ چەمئاخۆرە؛ تەجیر؛ پەژان؛ چیلە؛ کۆت؛ کەناری؛ کمان؛

لمێنج؛ دیوارۆکەی لە درکوداڵ بەدەوری باخ و بێستاندا.

**پرحرف** / porharf/: [فارسی/ عربی] *صفت*. زۆربلێ؛ زۆربڵە؛ چنرووو؛ چنرۆ؛ چەنەباز؛ چەنەدرێژ؛ چنەدراز؛ وزە؛ چەقەچناوە؛ زۆربەقسە؛ فرەڕێس؛ فرەبێژ؛ وڕاج ‹چقدر پرحرف بود: چەندە چەنەباز بوو›.

**پرحرفی** / porharf î، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم*. چەنەبازی؛ فرەوێژی؛ چەنەدرێژی؛ وڕاجی ‹پرحرفی کافی است: چەنەبازی بەسە›.

**پرخاش** / parxāš، ـها/: *اسم*. *[ادبی]* هەڵچوویی؛ پەرفەش؛ رووشی؛ شاخە؛ ئاکار و قسەی دژانەی تێکەڵ بە نارەزاییەوە ‹او با پرخاش بچەها را بیرون کرد: بە هەڵچوویەوە منداڵەکانی دەرکرد›.

**پرخاشجو** / parxāšcû/ ☜ **پرخاشگر**

**پرخاشجویی** / parxāšcûyî/ ☜ **پرخاشگری**

**پرخاشگر** / parxāšgar، ـها؛ ـان/: *صفت*. تیزۆ؛ شاخی؛ درژ و گرژ؛ شەڕلا؛ رووش؛ هەڵتووزێن؛ شەڕانی؛ شەڕاشۆ؛ هەڵچوو؛ جینگن؛ جرجۆنگانێ؛ پلەندەر؛ پەنگلەمێش؛ خاوەن ئاکاری هەڵچووناوی و نەگونجاو ‹انسان پرخاشگر: مرۆی شەڕانی›. هەروەها: **پرخاشگرانه**

**پرخاشگری** / parxāšgarî، ـها/: *اسم*. شەڕلایی؛ شەڕاشۆیی؛ جینگنی؛ ئاکار یان بەرپەرچی توند و تیژ لە رووی خەڵکیدا بۆ دەستەبەرکردنی شتێک یا داسەپاندنی کارێک ‹نباید با دوستانت پرخاشگری کنی: نابێ لەگەڵ دۆستانتدا شەڕلایی بکەی›: **پرخاشجویی**

**پرخرج** / porxarc/: [فارسی/ عربی] *صفت*. بەخەرج؛ گران؛ نرخزۆر؛ بوها؛ خەرجدار ‹سفر پرخرجی بود: سەفەرێکی بەخەرج بوو›.

**پرخور** / porxor، ـها/: *صفت*. حەفی؛ زۆرخۆر؛ فرەخوەر؛ خۆشخۆر؛ بخۆر؛ حەفیان؛ کەلپاچا؛ تێرنەخۆر؛ چڵەک؛ مێژک؛ هەستیکوژ؛ دەوریلێس؛ ورگدڕاو؛ زکتێڕ؛ خوارۆخ؛ خۆرا؛ خۆهرا؛ لەمووو؛ چەلمووس؛ هنجگە؛ خورەمیرە؛ مرخنەکدار؛ قارزک؛ واردۆخ؛ شەپەلۆخ؛ زکوون؛ زکن؛ سکن؛ زکێ؛ زککوور؛ زکدڕاو؛ سکدریاگ؛ دەلیالووش؛ فرەوەر؛ لەمدڕیا؛ ورگن؛ ئەشقەمە چیتین ‹خیلی پرخور است: یەکجار زۆرخۆرە›.

**پرخوری** / porxorî، ـها/: *اسم*. زۆرخۆری؛ فرەخۆری؛ ورگدڕاوی؛ ملومانی ‹پرخوری نکن! دلت درد می‌گیرد: زۆرخۆری مەکە! ژان ئەکەی›.

**پرداخت** / pardāxt، ـها/: *اسم*. ١. کار یان رەوتی دان؛ پێدان؛ دانەوە. بەرانبەر: **دریافت** ‹پرداخت بدهی: قەرز دانەوە› ٢. پەرداخ؛ کار یان رەوتی ساولووسەدان و دوایین پێکهێنانی بەرهەمی هونەری یا داهاتی دەسکرد ‹این تخته‌نرد چقدر خوب پرداخت شده است!: ئەم تەختەنەردە چەند باش پەرداخ کراوە!› ٣. *[حسابداری]* دراوە؛ دریاگ؛ ئەوەی کە دراوە یان دەدرێ (زیاتر بە سەرجەمی). بەرانبەر: **دریافت** ٤. رووتووش؛ پەڵە هەڵگری لە سەر هەر شتێک.

▣ پرداخت کردن: دانەوە؛ دان؛ پێدان؛ پێدانەوە.

**پرداختکار** / pardāxtkār، ـها؛ ـان/: *اسم*. پەرداخکار: ١. کەسێ کە کاری ساولووسەدان و پەرداخی بەرهەمی هونەری یا داهاتی دەسکردیە ٢. رووتووشکار؛ پەڵەهەڵگر.

**پرداخت‌کننده** / pardāxtkonande، ـها؛ ـگان/: *اسم*. ١. پەرداخکار ٢. پارەدەر؛ ئەوەی پووڵ دەدا.

**پـــرداختن** / pardāxtan/: مـــصدر. متعـــدی. //**پرداختـــی**: دات؛ **مـــی‌پـــردازی**: دەدەی؛ **بِپـــرداز**: بـــده// ۱. دان؛ دەی؛ دای ‹پـول پـرداختن: پـاره دان› ۲. خـەریـک بـوون؛ پـەرژان؛ پـەرژیـان؛ پـەرژیـن؛ هـەڤـژین؛ سـەرقـاڵ بـوون ‹بـه کـار پرداختن: بە کـارەوە خـەریـک بـوون›. هـەروەهـا: **پرداختنی**

■ صـفت فـاعلی: **پردازنـده** (ــ)/ صـفت مفعـولی: **پرداختـــه** (دراو)/ مـــصدر منفـــی: **نَپـــرداختن** (نەدان)

**پرداختـــی**[1] / pardāxtî، ـهـا/: اسـم. دراوی؛ دریـــاگی؛ ئـــەو شـــتەی دراوە یـــان دەدریٚ ‹پرداختی شما چقدر بود؟: ئێوە چەندتان داوە؟›.

**پرداختـــی**[2]: صـفت. دراو؛ دراوە؛ دریـاگ؛ دریـا ‹بابت پـول پرداختـی رسید دریافت کنید: بـۆ پـارەی دراو بەلگە وەرگرن›.

**پـردار** / pardār، ـهـا؛ ـان/: صفت. ۱. پـەڕدار؛ بـەپـەڕ ‹پـای پـردار: پـای پـەڕدار› ۲. بالـدار؛ پەڕدار ‹مورچەی پردار: مێرووڵەی باڵدار›.

**پـرداز**[1] / pardāz، ـهـا/: اسـم. هاشـوور؛ هێـڵی زۆری هـاو ڕیـز کـە لـە نـەخـشەکێـشی یـا هـەڵـکەندنـدا بـۆ سـێبەردان و دیـاری‌کـردنی ئاسـتگەلی جیـاواز بـە کـار دیٚ ‹از پـرداز نقشه پیداسـت کـه ایـن قـسمت پـشت مـی‌اُفتـد: لـە هاشووری نەخشەکەدا دیارە ئـەم پاژە دەکـەوێتـە پشتەوە›: **هاشور**

- **پـرداز**[2]: پیـواژه. ــ رازیـن؛ - تـەوزیـن؛ - ڕێـژ؛ رازێنەر؛ ڕێکخەر ‹چهره‌پرداز: ڕوومەت‌رازین›.

**پـردازش** / pardāzeš، ـهـا/: اسـم. دەسـتکاری، پتـەوکـاری، گۆڕانکـاری یـان ڕێکخـستنی زانیارییێک بۆ ئـەوەی لـە شـێوەییێکـەوە بکرێتـە شێوەییێکی‌تر یا بکرێتە شتێکی بەکەلک.

**پردازنـده** / pardāzande، ـهـا/: اسم. ڕێکخـەر؛ بەشێک لە دەزگای خێراکـار کـە بـە پێـی ئـەو شتانەی کە پێی دەدریٚ کار دەکا.

**پرداویـز** / pardāvîz، ـهـا/: اسـم. پـەرداشـۆڕ؛ پەرداڵۆچ؛ پەرداوێز؛ پەردەی عەموودی.

**پردرآمـد** / pordarāmad/: صـفت. هـەزەخ؛ بەبارەچە؛ بە هۆرتە و داهاتی زۆرەوە.

**پردگـــی** / pardegî/: اسـم. [زیـستشناسـی] زەڕنـــەقووتـــەیـــی؛ ســـوورەســـاقەیـــی؛ چاونەکراوەیی؛ دەورانی پـێش لـە بالـغ بـوونی حەشەرە.

**پـردل** / pordel، ـهـا؛ ـان/: صـفت. دلازا؛ دلاوەر؛ دلێر؛ بوێر؛ بەدڵ؛ ئازا؛ بەجەرگ.

**پـرده** / parde، ـهـا/: اسـم. ۱. پـەردە؛ پـای؛ ڕووپۆشـی دەرگـا و پـەنجـەرە لـە قومـاش ۲. [کالبدشناسـی] پـەردە؛ تـوێژی تـەنـک لـە شـانە کـە ئـەنـدامێکی لـەش دادەپۆشـیٚ یـا دوو ئـەنـدام لـە یـەکتـر دادەبـڕیٚ ‹پـردەی گـوش: پەردەی گـویٚ› ۳. [گیاەشناسـی] پـەڕە؛ هـەرکـام لـەو گـەڵا ناسـکانەی ژێـر چـەتـری قارچـک و هەرشتێکی بـەو چەشـنە لـە گیـادا ٤. پـەردە؛ پـەردەی شـانۆ؛ بـەشـێک لـە شـانۆ کـە لـە مـــەودای چوونـــە ســـەر و هاتنـــە خـــواری پـــەردەییێکـــدا پیـــشان دەدریٚ ‹پـردەی اول: پەردەی یەکـەم› ۵. پەردە؛ پارچـەیـەکـی سـپی کـە فیلمـی لـە سـەر پیـشان دەدەن ‹آن فـیلم هنوز روی پـرده اسـت: ئـەو فیلمـە هێـشتا لـە سـەر پـەردەیـە› ٦. [موسـیقی] پـەردە؛ پـەردەی مووســـیقا ۷. [قـدیمی] تـاڵ؛ تالـی ئـامرازی مووسـیقا ۸. [مجـازی] هـەوا؛ ئاهـەنـگ؛ سـتران ۹. پـەردە؛ پارچـەیـەک کـە دیمـەنی لـە سـەر نـەخـش کـراوە (بـە تایبـەت دیمـەنی ژیـانی پێـشەوا ئایینیـەکـان و پیاوچاکـان و جاروبـارەش چیرۆکـــی پالـــەوانی یـــاخۆ دلـــداری) ۱۰. [معمـاری] دیوارۆکـەی ژێـر تـاقی گومبـەز ۱۱. [مجـازی] پـەردە؛ ئـەوەی نـەهێـڵیٚ بـاش شـتیٚ ببینـریٚ یـا بناسـریٚ ‹در پـرده سـخن گُفـتن: لـە پەردەدا قسەکردن›.

◙ پـردەی بکـارت: کچـێنی؛ بـن؛ دوختـرونی؛ توێژاڵـێکی ناسـک لـە سـەر شـەرمـی کچـە کە بەهۆی گوشارێکەوە دەدڕێ.
پردەی جنب ☜ جَنب
پـردەی چـشم: پـەڕەی چـاو؛ توێژاڵـی چـاو؛ هەرکام لە سێ توێژاڵی ناوەوەی چاو.
پردەی حصیری ☜ پردەحصیری
پـردەی رویـانی: پزانـگ؛ ئـەو پـەردەیـە کـە بێچووی گیانداران لـە قۆنـاغی ئاولـەمـەییـدا تێیدا دەبن و دەیانپارێزێ تا ساوا دەبن.
پردەی صفاق ☜ صِفاق
پردەی صماخ ☜ پردەیگوش
پردەی قلب: پەڕەی دڵ.
پردەی گوش: تـەپـڵی‌گـوێ؛ تـەپـڵی‌گـۆش؛ پەردەی‌گوێ؛ پەڕەی گوێ: پردەی صماخ
پـــردەی مغــز/ منـــژ: پـــەردەی مێـــشک؛ هـەرکـام لـەو سـێ‌پـەردەیانـە کـە مێـشک دادەپۆشن.
پـــردەی نقاشـــی: دیمـــەن؛ ڕوانگـــە و بەرچاوێک کە شێوەکاری کراوە.
پـــردەی نمـــایش: پـــەردەی شـــانۆ: ١. پەردەیەکە لەبەری شـانۆدا هـەڵـیدەواسـن و ئـەوێ لـە جێـی دانیـشتنی تماشـاکەران جوێ‌دەکاتـە ٢. بـەشـێک لـە شـانۆ کـە لـە مەودای پەردە هـەڵـدان و دادانێکـدا پیـشان دەدرێ.
در پـردە: *[کنایی]* بـەدزیـەوە: ١. لـەژێـرەوە ٢. بەبۆڵە؛ بـەبۆڵـەبـۆڵ؛ لـەژێـر لێـوەوە؛ بـێ ڕووبینی و ڕاشکاوی.
◙ پـردە افتـادن: ١. کۆتـایی هـاتن؛ تـەواو بـوون؛ دوایـی هـاتنی شـانۆ ٢. *[کنایی]* لـە بنـــەهـــاتن؛ کۆتـــایی هـــاتنی ڕەوت یـــا ڕووداوێک.
پـردە برداشـتن: ١. پـەردەلادان؛ دامـەزران؛ ڕووکردن؛ لا بردنی پۆشـشی سـەر پـەیکـەر، تـابلۆ و... بـۆ دیـتنی هـەمـووان ٢. *[کنایی]* دەرخـــستن؛ بلاوکردنـــەوە؛ درکانـــدن؛ ئاشکارکردنی نهێنی.
پـــردە دریـــدن: *[کنایی]* ١. شـــواڵ لـــە پـــا دەرهێنان؛ حـەیـا بـردن؛ ئابـڕوو تکانـدن؛ ٢. قـاڵدان؛ قـاڵ دەرخـستن؛ قـاڵ زڕانـدن؛ نهێنی دەرخستن.
پـردە را بـالا زدن: *[کنایی]* پـەردە لـێ لادان؛ سـەرلـێ‌هـەڵـگرتن؛ درکانـدن؛ دەرخـستنی نهێنی.
پـــردە زدن: پـــەردە هـــەڵخـــستن؛ پـــەردە دادان؛ هـــەڵاوەســـینی پـــەردە لـــە شوێنێکەوە.
پـــردە کـــشیدن: پـــەردەکێـــشان؛ پـــەردە داخـــستن؛ پـــەردە دادان؛ دادانی پـــەردە و بلاوکردنـەوەی بـە شـێوەیـێ کـە دوو بـەش لە یەک دابڕێن.
از پردە بیـرون افتـادن: *[کنایی]* دەرکـەوتـن؛ بلاو بوونەوە؛ بۆدابن؛ ئاشکار بوون.
**پـردەبـرداری** / pardebardārî، ـهـا/: *اسم*. ١. کردنـەوە؛ پـەردەهـەڵـگری؛ پـەردەلادان؛ کـار یـان ڕەوتی هـەڵـگرتنی پـەردە لـە سـەر بەرهـەمێکـی هونـەری، تابلۆیـەکـی بـیرەوەری و... بۆ چـاو پێکـەوتـنی خـەڵـکی ٢. *[کنایی]* کـار یـان ڕەوتی دەرخـستن؛ وەدەرخـستن؛ پەردە لە سەر لادان.
**پـردەپوشـی** / pardepûšî، ـهـا/: *اسم*. *[کنایی]* پـــەردەپۆشـــی؛ کـــار یـــان ڕەوتی داپۆشـــان؛ شـــاردنەوە؛ هـــەڵـــگرتن؛ بـــن‌لـــێچدان؛ سەختکـەردەی؛ بـە نهـێنی هـەڵـگرتنی کـار یـا ئاکـاری کـەسـێکی‌تـر ‹سالها راز شوهرش را پردەپوشـی کـرد: چـەنـای چـەن سـاڵ نهـێنی مێردەکەی داپۆشی›.
**پـردەحـصیری** / pardehasîrî، ـهـا/: [فارسی/ عربی] *اسم*. چیـخ؛ چیـغ؛ پـەردەی لـە قۆتـەی

زەل و قامیش چنراو کە بە سەر دەلاقەدا هەلیدەواسن، تاوی خۆر نەیەتە ژوورەوە.

**پردەدار** [1] / pardedār، ـها؛ ـان/: اسم. [قدیمی] ١. پایوان؛ دەرگەوان؛ درگابان؛ بەرەوان؛ پەردەدار؛ خزمەتکاری تایبەتی ژووری حاکمان ٢. ئەو کەسەی کە پەردەگەلی شێوەکێشراو سەبارەت بە چیرۆکانی پیشان دەدا و چیرۆکی دەگوتەوە.

**پردەدار** [2]: صفت. پەردەدار؛ بە پەردەوە ‹پاهای پردەدار مُرغابی: پای پەردەداری مراوی›.

**پردەداری** / pardedārî، ـها/: اسم. پەردەداری؛ کاری پەردەدار.

**پردەدری** / pardedarî، ـها/: اسم. [کنایی] سۆدەرەیی؛ فتنەیی؛ زارشڕی؛ دەمشڕی؛ کار یا ڕەوتی دەرخستن یا وەگەڕ خستنی کار یان ئاکاری نابارى کەسێک ‹آن روز نخواستم پردەدری کنم و همە چیز را بگویم: ئەو ڕۆژە نەمویست سۆدەرەیی بکەم و هەموو شتێ بلێم›.

**پردەسرا** / pardesarā/ ☜ سَراپَردە

**پردیس** / pardîs، ـها/: اسم. [ادبی] سپێران؛ باخی بەهەشت؛ باخی زۆر خۆش و گەش.

**پررنگ** / por.rang/: صفت. پڕڕەنگ: ١. تۆخ؛ ڕەنگی تیژ ‹آبی پررنگ: شینی تۆخ› ٢. تاڵ؛ ڕەنگدار؛ ڕەش؛ پرمایە؛ خەست ‹چای پررنگ: چایی تاڵ›.

**پررو** / por.rû/: صفت. [گفتاری] ڕوودار: ١. ساواز؛ سایواز؛ ڕێلاس؛ قولتەش؛ قولتەشە؛ ڕووسەخت؛ بەڕوو ٢. بێچاو و ڕوو؛ ڕووهەلماڵراو؛ بێشەرم و شوورەیی؛ تورمتە ‹تو او را پُررو کردەای: تۆ ڕوودارت کردووە›.

**پررویی** / por.rûyî، ـها/: اسم. ڕووداری: ١. ساوازی؛ قولتەشی؛ قسەڕەقی ‹اگر پررویی کنی گوشت را می‌کشم: ئەگەر ڕووداری بکەی گوێت هەلدەکێشم› ٢. بێشەرمی؛ بێحەیایی؛ ڕووهەلماڵراوی؛ بێچاو و ڕوویی ‹آدم بە این پررویی دیدە بودی؟: مرۆی بەم بێشەرمیەت دیبوو؟›.

**پرریزان** / par.rîzān/: اسم. تووکوەران؛ پەڕوەران؛ پەڕوەرین؛ ڕووتانەوە؛ کار یا ڕەوتی وەرینی پەڕی پەلەوەران لە وەرزێکی تایبەتی سالدا.

**پرز** / porz، ـها/: اسم. ١. خاو؛ پۆشال؛ ڕیشوو؛ پرز؛ بڕ؛ چین؛ بژانگ؛ بڕژۆل؛ پرزەی شاڵ و قالی ٢. کولک؛ تووک؛ نەرمەتووک ٣. [کالبدشناسی] گرنج؛ نیتکە؛ پرز؛ وردە زۆپی سەر بڕێ لە ئەندامانی لەش ‹پرز زبان: گرنجی زمان›.

▣ پرز رودە: گرنجی ڕێلەخۆ؛ گرنجی وردیلەی دیوی ناوەوەی ڕیخۆلە.

پرز زبان: گرنجی زمان؛ وردە پرزانی سەر زمان کە کاری چێژانیان وەئەستۆیە.

**پرزدار** / porzdār/: صفت. گرنج‌ـگرنج؛ برژۆلدار؛ بژانگدار؛ پرزدار.

**پرزور** / porzûr/: صفت. ١. زۆردار؛ وزەدار؛ بەهێز؛ پرهێز؛ توانا ‹او مرد پرزوری است: ئەو پیاوێکی زۆردارە› ٢. بە تەوژم؛ بە تەوەژم؛ بەلێشاو؛ بەلووزەو؛ لووش ‹آب رودخانە خیلی پرزور بود: ئاوی چۆمەکە یەکجار بە تەوژم بوو›.

**پرزیدنت** / p(e)rezîdent، ـها/: [انگلیسی] اسم. سەرۆک؛ سەرۆک‌کۆمار.

**پرس** / p(e)res/: [فرانسوی] اسم. پرێس: ١. ـها/ مەنگەنە ٢. کاری پرێس‌کردن؛ مەنگەنەدان؛ لەژێرنانی شتێک بۆ گوشارێکی زۆر ٣. زرکۆ؛ گزرە؛ ڕیسی؛ گیای کوتراو و گێرەکراو.

▣ پرس‌کارت: پرێسی کارت.

▣ پرس شدن: ١. فلیقان؛ فلێقیان؛ دافلیقان؛ تلەقیان؛ تلیقان؛ پلتەوە بوون؛

بڵ بوون؛ تلخیان؛ پان بوونەوە؛ فلێقیەی ۲. پرێس بوون؛ مەنگەنە بوون. هەروەها:
**پرس کردن**

**پرس** / pors/: [از فرانسوی]/اسم. دەس؛ ژەمێکی خواردن لە چێشتخانەدا.

**پرسان** / porsān/: صفت. بەپرس؛ پرس‌دار؛ پرسیارکەر؛ پرسۆک؛ پەرسان ‹چهرەی پرسان: چاری بەپرس›.

**پرسان ـ پرسان** / porsānporsān/: قید. پرساوپرس؛ پرسێن ـ پرسێن؛ پرسان ـ پرسان؛ پەرسان ـ پەرسان؛ نوونەن‌نوون؛ بە لەم و لەو پرسین ‹پرسان ـ پرسان خانه‌اش را پیدا کردم: پرساوپرس ماڵەکەیانم دۆزیەوە›.

**پرسپکتیو** / perespektîv، ـها/: [فرانسوی] اسم. دیمەن: ۱. دیتبار؛ وێنەی سێ‌پاڵووئاسای هەر شتێک لە سەر پەڕەی کاغەزەوە ۲. [مجازی] روانگە؛ بەرجەوەن؛ بەرجەوەند؛ بەرژەوەند.

**ـ پرست** / parast/: پیواژە. ـ پەرست؛ ـ پەرەست؛ ـ پەرس؛ ـ پەرەس؛ ـ پرێس؛ پەرستندە ‹بت‌پرست؛ بیگانه‌پرست: بت‌پەرست؛ نامۆپەرەس›.

**پرستات** / porostāt/: [فرانسوی] ☜ **پُرُوستات**

**پرستار** / parastār، ـها؛ ـان/: اسم. پەرستار؛ پەرەستار: ۱. خەمخۆر؛ کەسێ کە کاری پێخۆردان، پۆشتەکردن، خەواندن و پاک و خاوێن‌کردنەوەی کەسێکی (بەتایبەت منداڵ، پیر و زورهان یا نەخۆش) وە ئەستۆیە ۲. تیمارکەر؛ یاریدەری نەخۆش؛ خزمەتکاری نەخۆش؛ کەسێ کە هێندێ شتی تایبەتی فێر بووە و دەتوانێ کاری تیمارکردن جێبەجێ بکات. هەروەها:
**پرستار اتاق عمل؛ پرستار شب؛ پرستار کشیک**

**پرستاری** [1] / parastārî، ـها/: اسم. پەرستاری؛ پەرەستاری: ۱. کاری پەرستار ۲. چاوەدێری و خزمەتکاری لە کەس یا کەسانێک (بەتایبەت نەخۆش، منداڵ یان پیر) کە ناتوانن کار و باری خۆیان بەڕێوە بەرن ‹چند سال از مادرش پرستاری می‌کرد: چەند ساڵ لە دایکی پەرستاری دەکرد› ۳. تیماری؛ جێبەجێ‌کردنی خزمەتی دەرمان بۆ نەخۆش بە چاوەدێری بژیشکەوە ‹پرستار بیمارستان: پەرستاری نەخۆشخانە›.

**پرستاری** [2]: صفت. پەرستاری؛ سەر بە پەرستار ‹لباس پرستاری؛ آموزشگاه پرستاری: جل‌وبەرگی پەرستاری؛ فێرگەی پەرستاری›.

**پرستش** / parasteš، ـها/: اسم. کار یان ئاکاری پەرستن ‹پرستش خدای یگانه: پەرستنی خودای تاک›.

◘ **پرستش کردن**: پەرستن؛ پەرەستین؛ پەرەسین؛ پەرسین؛ پەرەسەی؛ پرێسەی ‹هر بامداد خورشید را پرستش می‌کردند: هەموو کازیوەیەک هەتاویان دەپەرست›.

**پرستشگاه** / parastešgāh، ـها/: اسم. پەرستگە؛ پەرەسگە؛ پەرەسینگە؛ پرێسگا؛ دێوەڵ ‹پرستشگاه کلیمیان: پەرەستگەی جووەکان›.

**پرستو** / parastû، ـها؛ پرستوان parastovān/: اسم. پەڕەسیلکە؛ پەڕەسێلکە؛ پەڕەسلێرکە؛ پەڕەسلێنکە؛ پەڕەسوێلکە؛ پەڕەسێولکە؛ پەڕەسێرکە؛ پەڕەسیسە؛ پلیسر؛ پلیسرک؛ پلیرسگ؛ پلیسری؛ پولیسور؛ پلیزرک؛ پریزگرد؛ پلوسگر؛ مەقسوک؛ حاجی‌ڕەش؛ حاجی‌ڕەشک؛ حاجی‌ڕەنگ؛ حاجی‌حاجک؛ هەجەجک؛ هەچەجک؛ تەرنەبابیلە؛ سیپریسک؛ سیاپوسینگ؛ پزلگرد؛ کاردەپەلە؛ دوومقەس؛ مقەسۆک؛ دومقەسەک؛ دومقەسوک؛ دومەقەسەک؛ سیاپورسینک؛ پروسنەک؛ باڵداری

کۆچەری لە چۆلەکە گەورەتری ڕەش و سپی کە بە کۆمەڵ دەفڕن.

◘ **پرستوی دریایی:** ماسیخۆرکە؛ ماسیگیرە؛ ماسیەوچنە؛ ماییچنەک؛ پەڕەسیلکەی زەلیایی؛ پلێزرە ماسیخۆرە: **آبدَمزَن**

**پرستیدن** / parastîdan/: *مصدر. متعدی.* //**پرستیدی:** پەرستیت؛ **میپرستی:** دەپەرستی؛ **بپرست:** بپەرستە// پەرستن؛ پەرەسین؛ پەرەستین؛ پەرەستن؛ پرێسەی.

■ صفت فاعلی: **پرستنده** (ــ)/ صفت مفعولی: **پرستیده** (پەرستراو)/ مصدر منفی: **نَپرستیدن** (نەپەرستن)

**پرستیژ** / p(e)restîj/: [فرانسوی] *اسم.* کەسایەتی ‹با این کار میخواست پرستیژ کسب کند: بەم کارەی دەیەویست کەسایەتی بەدەس بێنێ›.

◘ **به پرستیژ کسی برخوردن:** پێ بەرخواردن؛ پێداشکان.

**پرسش** / porseš، ـها/: *اسم.* پرس؛ پرسیار؛ پەرس؛ پرسین؛ ڤەپرسین؛ پرسینەوە: ١. کار یان ڕەوتی پرسیارلێکردن؛ وتەیێ کە وەڵامی دەوێ ‹به پرسش شما پاسخ مناسب داده خواهد شد: بە پرسیارەکەتان پەرسڤی شیاو دەدرێتەوە› ٢. کار یان ڕەوتی پرسیار کردن ‹در مقابل پرسش خبرنگاران سکوت کرد: لە هەمبەر پرسیاری هەواڵنێرەکانەوە بێدەنگ بوو› ❋ **سوآل**

◘ **پرسش کردن:** پرسیارکردن؛ پرسین؛ پەرسەی.

**پرسششونده** / porseš.šavande، ـها؛ ـگان/: *اسم.* لێپرسراو؛ پرسیارلێکراو؛ لێپرساو ‹پرسششونده ١٥ ثانیه فرصت دارد تا پاسخ دهد: لێپرسراو بۆ پەرسڤ دانەوە ١٥ چرکە دەرفەتی هەیە›.

**پرسش کننده** / prseškonande، ـها؛ ـگان/: *اسم.* پرسێنەر؛ پرسا؛ پرسکەر؛ پرسیارکەر؛ بەپرسیار ‹پرسش کننده میپرسد نظرتان در این باره چیست؟: پرسیارکەر دەپرسێ ڕاتان لەم بارەوە چیە؟›.

**پرسشگر** / porsešgar، ـها؛ ـان/: *اسم.* پرسیارکار؛ پرسکەر: ١. ئەوەی کە شتێک دەپرسێ ‹در اینجا من پرسشگر هستم نه شما: لێرەدا من پرسیارکارم نەک ئێوە› ٢. ئەوکەسەی پرسیار لەمەڕ باسێکی تایبەتی لە تاقمێکی دیاریکراوی بە ئەستۆیە ‹پرسشگر، همین پرسش را از ١٠ نفر دیگر هم پرسید: پرسکەر هەر ئەم پرسیارەی لە ١٠ کەسی دیکەش پرسی›.

**پرسشگزین** / porsešgozîn، ـها؛ ـان/: *اسم.* پرسچن؛ پەرسەچن؛ پرسیاربژێر؛ کەس یان تاقمێک کە بۆ پرسین و بەدەس هێنانی زانیاری تایبەت، پرسیار هەڵدەبژێرن.

**پرسشگزینی** / porsešgozînî، ـها/: *اسم.* پرسچنی؛ پەرسیارچنی؛ پرسیاربژێری؛ کار یان ڕەوتی هەڵبژاردنی پرسیار بۆ پرسین و بەدەسهێنانی زانیاریگەلی پێویست.

**پرسشنامه** / porsešnāme، ـها/: *اسم.* پرسنامە؛ پرسیارنامە؛ پەرسنامە؛ نووسراوەیەک کە پرسیارگەلێکی (زۆرتر چاپی) تێدا نووسراوە و لە لێپرسراو دەخوازن وەرامی هەرکام لە پرسیارەکان لە شوێنی خۆیدا بنووسێتەوە.

**پرسشی** / porsešî/: *صفت.* پرسیاری ‹جمله پرسشی: ڕستەی پرسیاری›.

**پرسمان** / porsmān، ـها/: *اسم.* تەوەرە؛ چەمک؛ کێشە؛ بابەت؛ بابەت و کارێ کە پێویستی بە لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە بۆ ڕێگە دۆزینەوە و چارەسەرکردن هەیە.

**پرسناژ** / personāj/: [فرانسوی] ☜ **شخصیت ـ۴**

**پرسنده** / porsande/: *صفت.* پرسا؛ بەپرس؛ پرسدار؛ پەرسکەر؛ دۆخ یان چۆنیەتی پرسیارکار بوون ‹نگاه پرسنده: ڕوانینی پرسا›.

**پرسنل** / personel/: [فرانسوی] *اسم.* ئەندام؛ کۆمەڵەی کارگێڕانی دامەزراوەیێک یان بەشێک لەو دامەزراوە ‹پرسنل دفتری: ئەندامی نڤیسینگەیی›.

**پرسنلی** / personelî/: [فرانسوی] *صفت.* ئەندامی؛ ئەندامەتی.

**پرس و جو** / pors-o-cû، ـها/: *اسم.* [گفتاری] پرسوجۆ؛ کار یان ڕەوتی ڤێکەتن؛ توێژینەوە بۆ بە دەستهێنانی زانیاری یان زانینی ڕاستی و چەوتی ئەو زانیاریە ‹در مورد آزاد از دکانداران اطراف پرس‌وجو کرده بودند: لەمەڕ ئازادەوە لە دوکاندارەکانی دەوروبەر پرسوجۆیان کردبوو›.

**پرسه** / parse/: *اسم.* لاتە؛ ڕاوێچکە؛ هاتوچووی بەردەوام و بەڕواڵەت بێمەبەست.

▣ پرسه زدن: [گفتاری] خولانەوە؛ گەڕاڵی کردن؛ لاتە هاتن؛ گیج ئەلاوردن؛ گێژ هەلاوردن؛ ڕاوێچکە کردن؛ خول خواردن؛ هاتوچووکردنی بەبێهۆ ‹کارش شده پرسه‌زدن توی خیابان: کاری بۆتە خولانەوە بە شەقامدا›.

**پرسه** / porse، ـها/: *اسم.* پرسە؛ پەرسە؛ سەرەخۆشی؛ فاتحەخوانی؛ فاتیحاخوێنی؛ ڕێوڕەسمی دیمانە لەتەک ئەوانەی کەسێکان لێ مردووە و ڕێزلێنانی کۆچکردوو.

**پرسی** [1] / porsî/: *قید.* دەسێ؛ دەسێک؛ دەسێو ‹چلوکباب پرسی ۲۵۰۰ تومان: چلاو کەواو دەسێک ۲۵۰۰ تمەن›.

**ـپرسی** [2]: *پیوازه.* ـ پرسی؛ ـ پەرسی؛ کار یان ڕەوتی پرسین و پەیگیر بوون؛ پرسان؛ پەرسەی ‹احوالپرسی: هەواڵپرسی›.

**پرسیدن** / porsîdan/: *مصدر. متعدی.* //**پرسیدی**: پرسیت؛ **میپرسی**: دەپرسی؛ **بپرس**: بپرسە// پرسین؛ پورسین؛ پرسان؛ پەرسەی؛ پەرسای؛ پرسیارکردن: ۱. لەمەڕ کەس یان شتێکەوە ئاگاداری یان وەڵام ویستن ‹درس پرسیدن: وانە پرسین› ۲. پرسکردن؛ پەرسکەردەی؛ پرسینەوە یان لێکۆڵینەوە لەمەڕ بابەتێکی تایبەتەوە ‹قیمت چیزی را پرسیدن: نرخی شتێک پرسین›.

هەروەها: **پرسیدنی**

■ صفت مفعولی: **پرسیده** (پرسراو)/ مصدر منفی: **نَپرسیدن** (نەپرسین)

**پرش** / pareš، ـها/: *اسم.* ۱. باز؛ پەڕشت؛ واز؛ وەز؛ بازد؛ فنجک؛ گەڵتاف؛ لیتک؛ قەڤز؛ قەڵباز؛ قەفاز؛ قەڵبەز؛ قومچ؛ قومل؛ هەڵقوم؛ خنج؛ لنگەئەستەنە؛ کوانچە؛ دەقەلۆز؛ بازباز؛ چلاپە؛ چرتک؛ کار یان ڕەوتی پەڕان؛ پەڕین؛ پڕەی؛ قەگەمزین؛ خۆهەڵدان؛ بازدان؛ بازهاویشتن؛ بازبردن ۲. کار یان ڕەوتی فڕین؛ فڕیەی؛ لێدان ‹پرش چشم: فڕینی چاو›.

▣ پرش ارتفاع: هەڵبەزان؛ وەرزشێک کە دەبێ وەرزشکار بەسەر بەرزییەکدا باز داتەوە.

پرش سه‌گام: هیرگام؛ سێباز؛ پەڕینی سێباز.

پرش طول: قەڵەمبازان؛ وەرزشێک کە دەبێ وەرزشکار تێکۆشێ هەرچێک زیاتر بەرەو پێش باز داتەوە.

**پرشر و شور** / poršar-o-šûr، ـها/: [فارسی/ عربی/ فارسی] *صفت.* سەربزێو؛ زرت و زینوو؛ زرک و زینگ؛ زیتەڵ؛ زیتەڵە؛ بزۆز؛ زرت و

زریو ‹جوانی شاد و پرشر و شور بود: لاوێکی شاد و سەربزێو بوو›.

**پرشور** / poršûr/: صفت. بەتین؛ بەگوڕ؛ بەگڕ؛ پڕشۆر؛ پڕجۆش و خرۆش؛ پڕ لە شەوق و هەست ‹ناطق سخنان پرشوری گفت: وێژەوان قسەی زۆر بەتینی گوت›.

**پرطاووسی** / par(e)tāvûsî/: [فارسی/ معرب] ☜ **پرتاووسی**

**پرفراتور** / perforātor، ـها/: اسم. ئاژکە؛ ئامرازی برکە-برکە یان بەڕیز کون کردن.

**پرفراژ** / perforāj، ـها/: [فرانسوی] اسم. ئاژدار؛ چینێک لە کونانی پەستاپەستا و لە دووی یەکی پەڕەیەک (وەک تەمر، فیلم و ...)، بۆ باشتر جیا بوونەوەی بەشەکانی لە یەک.

◘ پرفراژ کردن: ئاژدارکردن؛ برکە-برکە کردن؛ کونا-کونا کردن.

**پرفرما** / poroformā/: [انگلیسی] ☜ **پرۆفۆرما**

**پرفریب** / porfarîb/: صفت. فێڵباز؛ فریوباز؛ خاپینۆک؛ گزیکار؛ کەڵەکباز؛ چازۆ؛ گەڕساز؛ لابێنەر؛ بەفێڵ ‹روباه پرفریب: ڕێوی فێلباز›.

**پرفسور** / porfosor, por(o)fesor، p(e)rofesor، ـها؛ ـان/: [فرانسوی] اسم. پسپۆڕ؛ پستۆڕ؛ پروفسۆر: ١. مامۆستای زانکۆ ٢. [مجازی] بلیمەت؛ زانا؛ لێزان ‹با چهار کلمه انگلیسی که یاد گرفته خیال می‌کند پرفسور شده است: بە چوار وشەی ئینگلیسی کە فێر بووە وا دەزانێ بۆتە بلیمەت› ✽ **پروفسور**

**پرفشار** / porfešār/: صفت. بەگوشار؛ بەتەوژم؛ بەزەخت ‹آب پرفشار: ئاوی بەگوشار›.

**پرقیچی** / parqeyčî، ـها/: [فارسی/ ترکی] صفت. [گفتاری] لایەنگر؛ لاگیر؛ لاگر؛ دژدار؛ هەواخوا ‹از پرقیچی‌های کدخدا بود: لە لایەنگرانی کوێخا بوو›.

◘ پرقیچی کسی شدن: [کنایی] لایەنگری کەسێ بوون؛ بە دڵ وگیان پشت کەسێ گرتن.

**پرک** / parak/: اسم. ١. چارەوەز؛ تێکولی ناسکی برێ لە میوەگەل (وەک گوێز) یان دانەوێلە ٢. دانەوێلەی توێکڵ گیراو؛ گەنم یان جۆی تۆکەوگیریاگ کە دەکرێتە ناو برێ چێشتەوە ‹گندم پرک: گەنمی توێکڵ پاک›.

**پرک** / perk/: اسم. چەقەوڕ؛ چەکەوڕ؛ بۆچەکەوڕ؛ پەتەپرووز؛ بۆنی ڕۆن و چەوری سووتاو.

**پرکار** / porkār/: صفت. پڕکار؛ کارلێهاتوو؛ بەکار ‹شخص پرکار؛ غدەی پرکار: مرۆی کارلێهاتوو؛ لکی پرکار›.

**پرکاری** / porkārî/: اسم. کارزۆری؛ پڕکاری: ١. دۆخ یان چۆنیەتی پڕکاربوون ‹آزاد به دقت، انضباط و پرکاری معروف است: ئازاد بە وردبینی، تەکووزی و پڕکاری بەناوبانگە› ٢. دوخ یان چۆنیەتی کاری لە ڕادەبەدەر ‹پرکاری تیروئید: پڕکاری تیرۆئید›.

**پرکامبرین** / p(e)rekāmberiyan/: [فرانسوی] اسم. پرێکامبێریەن؛ سەرەتای مێژووی زەوین.

**پرکننده** / porkonande، ـها/: اسم. پڕکەرەوە؛ پڕەوکەرەوە؛ پەڕەووەکەر: ١. ئامرازی پڕکردنەوە ‹دستگاه پرکنندەی شیر پاکتی: ئامرازی پڕکەرەوەی شیری پاکەتی› ٢. فیلێر؛ هەرچی بۆ پڕکردنەوەی هەڵۆلی یان زیادکردنی بارستایی و قورسایی بەرهەمگەلی پیشەسازی بەکار دێت ‹پرکنندەی چسب: پڕکەرەوەی چەسپ›.

**پرگار** / pargār، ـها/: اسم. پەرگار؛ پەرکاڵ؛

پەرگال؛ جەغزینگ؛ ئامرازی جەغزکێشان.

**پرگو** / porgû/: صفت. فرەوێژ؛ فرەبێژ؛ زۆربلێ؛ چەنەباز؛ درێژدادڕ؛ زماندرێژ؛ وڕاج؛ قسەفرەکەر؛ لاژگ؛ چەناکەدەر ‹گیر یک آدم پرگو افتاده بودم: بەوومە تووش کابرایەکی فرەبێژەوە›.

**پرگویی** / porgûyî، ـها/: اسم. فرەبێژی؛ فرەبێژی؛ زۆربلێیی؛ چەنەبازی؛ درێژدادڕی؛ وڕاجی؛ زۆربێژی؛ لاژگی؛ کار و ڕەوتی زۆر و (زیاتر) بە بێ‌هۆ قسەکردن ‹وقتشان را به تنبلی و پرگویی می‌گذرانند: کاتیان بە تەوەزەلی و فرەبێژی ڕادەبوارد›.

**پرگهر** / porgohar/: صفت. [ادبی] پڕگەوهەر؛ بایەخدار؛ نایاب ‹سخنان پرگهر: وتەی پڕگەوهەر›.

**پرلتاریا** / poroletāryā/: [فرانسوی] ☜ **پرولتاریا**

**پرلتر** / poroleter/: [فرانسوی] ☜ **پرولتر**

**پرلن** / perlon/: [؟]اسم. پێرلۆن؛ نایلۆن؛ هەودای دەسکرد: **پرلون**

**پرلود** / p(e)relûd، ـها/: [؟]اسم. [موسیقی] دەسپێک.

**پرلون** / perlon/: [؟] ☜ **پرلن**

**پرماه** / pormāh/: اسم. مانگی تەواو؛ مانگی شەوی چاردە؛ مانگی چاردە.

**پرمایه** / pormāye/: صفت. ۱. [ادبی] بایەخدار؛ پڕبایەخ؛ بەبایەخ؛ بەنرخ ‹کتاب پرمایه: کتێبی بایەخدار› ۲. خەستوخۆڵ؛ هەس‌وهۆڵ؛ پڕمەلات؛ پڕهەوێن؛ پڕئامیان ‹آش پرمایه: ئاشی خەستوخۆڵ› ۳. [مجازی] زانا؛ بلیمەت؛ شارەزا؛ هێژا ‹انسان پرمایه: مرۆی زانا›.

**پرمدعا** / pormodda'ā/: صفت. بەدەمار؛ بەفیز؛ لووت‌بەرز؛ بەدەعیە؛ دەمارزل؛ دەماربەرز؛ بادی‌هەوا؛ نەستەق‌زل؛ بەنەستەق؛ بەهەوا؛ فیزۆڵ؛ ترزل ‹گدا و این قدر پرمدعا؟!: سواڵکەر و ئەوندە بەدەمار؟!›.

**پرمدعائی** / pormodda'ā'î/: [فارسی/ عربی] ☜ **پرمدعایی**

**پرمدعایی** / pormodda'āyî/: [فارسی/ عربی]اسم. بەدەماری؛ بەفیزی؛ بەدەعیەیی؛ دەمارزلی؛ بادی‌هەوایی؛ نەستەق‌زلی؛ بەنەستەقی؛ بەهەوایی؛ فیزۆڵی؛ شات‌وشووتکەری؛ ترزلی ‹پرمدعایی خصلت آدمهای کم‌عقل است: دەمارزلی خووی مرۆی کەم ئاوەزە›: **پرمدّعائی**

**پرمغز** / pormaqz/: صفت. ۱. زانا؛ بەمژی؛ مەژگدار؛ مژیوەر؛ پرمێشک؛ بەهۆش ‹مرد فهمیده و پرمغز بی‌خودی حرف نمی‌زد: پیاوی ژیر و زانا لە خۆڕا قسە ناکا› ۲. مانادار؛ بەنرخ؛ بەکاکڵ؛ کاکڵەدار؛ بەکاکڵە. بەرانبەر: **پوچ** ‹حرف پرمغز: وتەی بەکاکڵ› ۳. بەکاکڵ؛ بەکاکڵە؛ کاکڵەدار؛ پرمێشک؛ مێشکدار؛ مەژگەدار. بەرانبەر: **پوک** ‹پستەهای پرمغز و خوبی خریده‌ای: پستەی بەکاکڵ و باشت کڕیوە›.

**پرمین** / permiyan/: [فرانسوی]اسم. پێرمیەن؛ حەوتەمین و ئاخرین خول لە دەورانی هەوەڵی زەوین‌ناسیدا.

**پرند** / parand، ـها/: اسم. ۱. جەوهەر؛ زاخدراو؛ ئاودار؛ تیغی جەوهەردار ۲. [ادبی] قوماشی هەورێشمی سادە؛ کووتاڵی ئاورێشمی ساکار ۳. بنجی ڕێواس: **پیرند؛ پیرن**

**پرندک** / parandak، ـها/: اسم. [ادبی] تەپۆکە؛ تەپۆلکە؛ تەپۆلە؛ تەپ؛ گرۆ؛ گردۆلە؛ تەپکە؛ تەپک.

**پرندگان** / parandegān/: اسم. پەلەوەران؛ فرندان؛ باڵندەیان؛ باڵداران؛ فڕۆکان؛ پەڕندان؛ بەشێک لە گیانداران کە لەشیان

بە پەڕ پۆشراوە، خاوەن دندووک، دووباڵ و دوو پێن، ددانیان نیە، هێلکە دەکەن و خوێن گەرمن.

▣ پرندگان آوازخوان: پەلەوەرانی ئاوازخوێن؛ باڵندەگەلی ستران‌بێژ.

پرندگان ساحلی: پەلەوەرانی لێو ئاوی.

پرندگان شاخه‌نشین: مریچلان؛ چۆلەکان؛ پەلەوەرەانی چلبەند.

**پرنده**[1] / parande، ـها؛ ـگان/: اسم. پەلەوەر؛ پەلەور؛ پەڕندە؛ باڵندە؛ باڵنە؛ فڕندە؛ فڕننە؛ باڵدار؛ فڕا؛ باڵ گرەوە؛ مەل؛ سر؛ توار؛ تەواڵ؛ هەرکام لە گیانلەبەرانی سەر بە پەلەوەران.

▣ پرندەی آبی: پەلەوەری ئاوی؛ باڵندەی ئاوی؛ مەلێکی چکۆلەی ستران‌بێژ لە ئەمریکای باکووریدا.

▣ پرنده پر نزدن: [کنایی] پەپوو خوێندن؛ کەپوو خوێندن؛ ورە نەهاتن؛ خشە نەهاتن؛ هێمن و چۆڵ بوون؛ خشت‌وخاڵی بوون ‹توی خیابان پرنده پر نمی‌زند: لەنێو شەقامدا پەپوو نەخوێنێ›.

**پرنده**[2]: صفت. فڕا؛ فڕە؛ پەڕندە ‹ماشین پرنده: گەڕۆکی فڕندە›.

**پرنده‌شناس** / parandešenās، ـها؛ ـان/: اسم. پەلەوەرناس؛ کەسێ کە لە بواری پەلەوەرناسیدا ئاگادار و زانایە.

**پرنده‌شناسی** / parandešenāsî/: اسم. پەلەوەرناسی؛ لقێک لە زانستی گیانەوەرناسی، سەبارەت بە ناسین، لێکدانەوە و ڕیزبەندی پەلەوەران.

**پرنس** / p(e)rans، ـها/: [فرانسوی] اسم. شازادە ‹پرنس ادوارد: شازادە ئیدوارد›.

**پرنسس** / p(e)ranses، ـها/: [فرانسوی] اسم. شاکچ؛ شادۆت؛ شاکنا ‹پرنسس مارگارت: شادوت مارگاریت›.

**پرنسیب** / p(e)ransîb/: [فرانسوی] اسم. پرەنسیب؛ گەد؛ دامەزراوی؛ گرساوی؛ جێ‌کەوتوویی ‹اگر پرنسیب سرت می‌شد نمی‌رفتی پشت دوستت حرف بزنی: ئەگەر پرنسیبت هەبوایە، نەدەچووی لە پشت سەری دۆستەکەتەوە قسە بکەی›.

**پرنیان** / parniyān/: اسم. [ادبی] پەرنیان؛ قوماشی هەورێشمی گوڵداری زۆر نەرم.

**پرو** / poro:, p(o)rov/: [فرانسوی] اسم. ڕوز؛ پێکەوە نووساندنی پارچەی بڕاو بۆ تاقی کردنەوە و بەراوردی پێش لە دووران.

**پروا** / parvā/: اسم. [ادبی] پەروا: ١. ترس؛ نیگەرانی یان دڵەڕەپەیەک کە بیر لە داهاتووی کارێک بەدی‌دێنێ ‹پروای جان خود نداشت: ترسی لە گیانی خۆی نەبوو› ٢. دڵەلەرزە؛ سڵ؛ سام؛ سامی؛ نیگەرانی لە گەزن و ئازاری کەسێ یان شتێک ‹از دشمن پروا نکرد و پیش رفت: سڵی لە دوژمن نەکرد و ڕۆیشتە پێشەوە› ٣. فەدی؛ فهێت؛ ڕێز؛ چاوەدێری؛ ئاکاری گونجاو لە هەمبەر کەسێک یان شتێکەوە ‹پدرم در خانه پروای همه را دارد: بابم لە ماڵدا چاوەدێری هەموو دەکا›.

▣ پروا نداشتن: ١. پەروا نەبوون؛ نیگەران نەبوون؛ نەترسان ٢. ☜ **پروا نکردن**

پروا نکردن: ١. نەترسیان؛ کۆ نەکردنەوە ٢. کۆ نەکردن؛ گرنگی پێ نەدان؛ چاونەدێران ***پروا نداشتن**

پروای چیزی/ کسی را داشتن: ١. کۆ کردنەوە لە شتێک/ کەسێک؛ نیگەرانی گەزەن یان ئازار دیتن لە هەمبەر کەسێ یان شتێکەوە بوون ٢. چاوەدێری کردن؛ هۆش پێوە بوون.

**پروار** / parvār، ـها/: صفت. ڕەپیتە؛ دابستە؛

دابەستە؛ دابەسیاگ؛ هەملک؛ پەروار؛ چاخ و گۆشتن لە بەر خزمەت و خۆراکی باش.

پرواربندی / parvārbandî، ـهـا/: اسم. دابەستەکاری؛ کار یان ڕەوتی دابەستنەوە؛ دابەستن؛ بەخێوکردنی ئاژەڵ بۆ گۆشت.

پرواری / parvārî/: صفت. بەختە؛ پەرواری؛ دابەستە؛ دەرماڵە؛ دەرماڵی؛ بەسلەمە؛ لە بار بۆ بەستنەوە ‹گوسفند پرواری: پەزی دابەستە›.

پرواز / parvāz، ـهـا/: اسم. پەرواز؛ کار و ڕەوتی فرین؛ هەڵفرین؛ هەڵفران؛ ڕفین: ١. باڵەواز؛ باڵ گرتنەوە بەهۆی باڵ لێدان ‹پرواز پرندە: فرینی باڵندە› ٢. هەڵدان؛ بەهۆی بەدەم باوە چوون ‹پرواز بادبادک: فرینی بەرزەحەوایلە› ٣. باڵ گرتنەوە بەهۆی موتۆر یان مووشەکەوە ‹پرواز هواپیما: فرینی فڕۆکە› ٤. سەفەر بە فڕۆکە ‹پرواز تهران ــ اربیل: پەروازی تاران ـ هەولێر›.

◘ پرواز جنگی: فرینی شەڕی.

پرواز خارجی: فرینی هەندەرانی؛ فرینی بیانی.

پرواز داخلی: فرینی ناوخۆیی.

◘ پرواز دادن: هەڵفراندن؛ هەڵفرانن؛ هەڵساندن؛ پەروازدان؛ باڵەوازەکردن؛ پەڕەوازەکردن؛ بوونە هۆی باڵ گرتنەوە.

پرواز کردن: ١. فرین؛ هەڵفرین؛ هل‌فرین؛ باڵگرتن؛ باڵگرتنەوە؛ فڕەکردن؛ هۆرفڕەی؛ لەشەقەی باڵدان؛ دەحەواوە چوون ٢. سەفەر بە فڕۆکە.

پروانسی / p(o)rovānsî/: [؟]/اسم. پرۆڤانسی: ١. زمانێکی ڕۆمیە کە ئێستا لە باشووری فەرانسە قسەی پێ دەکەن ٢. /ـها؛ ـان/ هەرکام لە خەڵکانی نیشتەجێی پرۆڤانس لە باشووری فەرانسە.

پروانه / parvāne، ـهـا/: اسم. ١. ـگان/ پەپوولە؛ پەروانە؛ پەپی؛ شاپەریک؛ پریریک؛ مینمینک؛ بەلاتیتک؛ باڵفرنەک؛ پەرپەرک؛ پەرپەرۆک؛ نمنموۆک؛ منمنک ٢. بروانامە؛ ئیجازەنامە؛ نووسراوەیەکی ڕەسمی کە بە خاوەنەکەی بەرایی جێبەجێ کردنی کارگەلێکی دیاریکراو دەدا ‹پروانەی ساختمان؛ پروانەی کار: ئیجازەنامەی ماڵ کردنەوە؛ بروانامەی کار› ٣. فرفرە؛ پەرە ‹پروانەی کشتی: پەرەی کەشتی›.

◘ پروانه‌های ابریشم: پەپوولەی ئاوریشم.

پروانه‌وار [1] / parvānevār، ـان/: صفت. [جانورشناسی] پەپوولەئاسا؛ پێوەندیدار یان سەر بە پەپوولەوە.

پروانه‌وار [2]: قید. پەپوولەئاسا؛ وەکوو پەروانە؛ وەکوو پەپوولە ‹پروانەوار دورش می‌چرخید: پەپوولەئاسا بەدەوریا دەخولایەوە›.

پر و بال / par-o-bāl/: اسم. دەست و دوو؛ پەڕ و باڵ؛ پەل و پۆ؛ پورت.

◘ پر و بال دادن: [مجازی] بەر بۆ شل کردن؛ دەست دانە ژێر؛ دەرفەت و هەل یان ڕێگە کار و دەست و پەل پێدان ‹خیلی بە او پر و بال دادند و او هم دیگر خدا را بندە نبود: زۆریان بەر بوی شل کرد، ئەویش تازە جوابی خودایشی نەدەداوە›.

پر و پا / par-o-pā/: اسم. [مجازی] ١. پا و پل؛ قاچ و قول؛ قول‌قاچ؛ خوارووی لەش؛ پاقەد ‹پروپای لُخت: قاچوقولی ڕووت› ٢. سەر و بن؛ سەر و بەر؛ بنەما؛ پایە ‹حرفهایش سر و پایی نداشت: قسەکانی سەر و بنێکیان نەبوو›.

◘ بە پر و پای کسی پیچیدن: پیچانە دەست و پای کەسێکەوە؛ لەکۆڵی کەسێک نەبوونەوە؛ پێچیانە قول و قاچ کەسێکدا ‹این قدر بە پر و پای من

میچ: ئەوەنده مەپیچه بە دەست و پای منەوە›.

**پـــر و پاچــــه** / par-o-pāče/: *اسم. [مجازی]* لاران؛ شلکەی‌ران.

▣ **پر و پاچه‌ی کسی را گرفتن:** *[تعریض]* قاچ کەسێ گرتن؛ قول کەسێ بردنە دەمدا؛ تێ‌هالان؛ تێ‌هالین ‹کارش شده بود پروپاچه‌ی همسایه‌ها را گرفتن: کاری بووە گرتنی قاچی جیرانەکان›.

**پـــر و پـــاقرص** / par-o-pāqors/: [فارسی/؟] *صفت. [مجازی، گفتاری]* ١. قایم؛ قورس و قایم؛ توند؛ پتەو؛ خۆگرتوو ٢. سوور؛ پێچەق؛ پێ‌داگر؛ پێ‌پتەو ‹طرفدار پر و پاقرص فوتبال است: لایەنگری پێ‌داگری فووتباڵە›.

**پروپاگانـد** / p(o)ropāgānd، ـها/: [فرانسوی] *اسم. [گفتاری]* بانگەشە؛ پروپاگەندە؛ ڕاگەیێنی؛ ڕاگەهاندن ‹این واقعیت است، پروپاگاند نیست: ئەمە ڕاستە، بانگەشە نیە›.

**پروپاگانـدچی** / p(o)ropāgāndčî، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ ترکی] *اسم. [تعریض]* ڕاگەیێنەر؛ ڕاگەهێنەر؛ بانگەشەچی.

**پروپـــــان** / p(o)ropān/: [فرانسوی] *اسم. [شیمی]* پرۆپان؛ گازێکە لە نەوت بەرهەم‌دێ و باش دەسووتێ.

**پروپن** / p(o)ropen/: [فرانسوی] ☜ **پُرُوپیلِن**

**پـــروپیلن** / p(o)ropîlen/: [فرانسوی] *اسم. [شیمی]* پرۆپیلن؛ گازێکە لە نەوت بەرهەم‌دێ و زۆرێک لە کاڵا نەوتیەکانی لێ دروست دەبێ: **پُرُپِن**

**پـــر و پیمـــان** / por-o-peymān/: *صفت. [گفتاری]* پڕ؛ پڕاوپڕ؛ لێوان‌لێو؛ لرپ؛ لیپ؛ تژە؛ تژی؛ دارماڵ؛ سەرڕێژ؛ لیپاولیپ.

**پروتـــــاکتینیم** / p(o)rotāktîniyom/: [فرانسوی/ انگلیسی] *اسم.* پرۆتاکتینیۆم؛ توخمی کیمیایی کانزایی ڕادیۆئەکتیف بە ڕەنگی سپی زێوین، لە دەستەی ئاکتێنیدەکان بە ژمارەی ئەتومی ٩١ و کێشی ئەتومی ٢٣١.

**پروتـــز** / p(o)rotez، ـها/: [فرانسوی] *اسم. [پزشکی]* پرۆتێز؛ کار و ڕەوتی دانانی ئەندامی دەسکرد (بەتایبەت ددان) لەجێ ئەندامانی لەکەلک‌کەوتوو.

**پروتست** / porotest/: [از فرانسوی] ☜ **پُرِتست**

**پروتـــستان** / porotestān/: [فرانسوی] ☜ **پُرِتستان**

**پروتکـل** / p(o)rotokol، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ڕێکەوتن‌نامە؛ پرۆتوکول: **پُرتُکُل**

**- پرور** / parvar/: *پیوأژه.* — پەروەر؛ بەخێوکەر ‹فرهنگ‌پرور: فەرهەنگ‌پەروەر›.

**پروراندن** / parvarāndan/: *مصدر. متعدی.* //**پروراندی**: ڕاتهێنا؛ **می‌پرورانی**: ڕادەهێنی؛ **بپروران**: ڕاهێنە// ڕاهێنان؛ عاملاندن؛ بەخێوکردن؛ بەخۆکردن؛ بەخۆدان‌کرن؛ چاخاندن؛ حاواندنەوە؛ پەروەراندن؛ پەروەرشت دان؛ بار هێنان؛ بەرهەم هێنان؛ سەرپەرشتی کردن؛ وەی‌کەردەی؛ پەروەرنەی: **پرورانیدن**. هەروەها: **پروراندنی**

■ صفت فاعلی: **پرورانندە** (ڕاهێنەر)/ صفت مفعولی: **پرورانده** (ڕاهێنراو)/ مصدر منفی: **نپروراندن** (ڕانەهێنان)

**پرورانیدن** / parvarānîdan/ ☜ **پروراندن**

**پروردگـــــار** / parvard(e)gār/: *اسم.* ١. ئافرێنەر؛ پەروەردگار؛ خوا؛ خودا ٢. *[قدیمی]* ڕاهێنەر؛ پەروەرێنەر.

**پـــروردن** / parvardan/: *مصدر. متعدی.* //**پـروردی**: بارت هێنا؛ **می‌پروری**: بار دێنی؛ **بپرور**: بار بێنە// ڕاهێنان؛ پەروەردن؛ پەروەردەی: ١. بەخێوکردن؛ بەخۆکردن؛ گەورەکردن؛ پەروەردەکردن؛ پەروەردە

کەردەی؛ وەی کەردەی؛ پەروەرشت دان ‹بچه پروردن: منداڵ بەخێوکردن› ٢. بارهێنان؛ پاڵ نان بە پێشڕەفت و پێشکەوتی کەسێ یان شتێکەوە؛ یاری و یارمەتیدان؛ پەروەراندن ‹ادب پروردن: ئەدەب پەروەراندن› ٣. خەملاندن؛ دروست کردن؛ ئامادەکردن؛ پەرەپێدان؛ رازاندنەوە؛ پەروەراندن ‹خیال پروردن: خەیاڵ دروست‌کردن› ٤. ☜ **پرورده-٢**

■ صفت فاعلی: **پرورنده** (بارهێنەر)/ صفت مفعولی: **پرورده** (بارهێنراو)/ مصدر منفی: **نَپروردن** (بارنەهێنان)

**پرورده** / parvarde/: *صفت.* پەروەردە: ١. بەخێوکراو؛ وەی‌کریا؛ پەروەرشت‌دراو؛ عاملاو ‹دست‌پرورده: دەست‌پەروەردە› ٢. خوەشە؛ خوەشەکریاگ؛ بارهاتوو ‹زیتون پرورده: زەیتوونی پەروەردە›. هەروەها: **پرورده کردن** ٣. دابەستە؛ دابەسیاگ.

▣ پرورده شدن: بارهاتن؛ راهاتن؛ بەخێو کران؛ پەروەریان؛ پەروەریەی.

**پرورش** / parvareš/: *اسم.* پەروەرشت: ١. کار یان رەوتی بەخێوکردن؛ بارهێنان ‹پرورش کودک؛ پرورش اسب: بەخێوکردنی منداڵ؛ بارهێنانی ئەسپ› ٢. کار یان رەوتی راهێنان؛ پێگەیاندن ‹پرورش اندام: راهێنانی لەش› ٣. کار یان رەوتی بارهاتن ‹او خوب پرورش یافته است: ئەو باش بارهاتووە›.

▣ پرورش اندام: پەروەرشتی لەش؛ بارهێنانی لەش.

▣ پرورش دادن: ١. پەروەردەکردن؛ پەروەراندن؛ گەورا کردن؛ بە خێوکردن؛ رەنێو هێنان ٢. بارهێنان؛ پەروەرشت دان.

پرورش یافتن: پەروەردە بوون: ١. گەشە پەیا کردن؛ گەشەساندن ٢. بارهاتن.

**پرورشگاه** / parvarešgāh/، ـها/: *اسم.* پەروەرشتگە؛ پەروەرشتگا: ١. شوێنی راگرتن و بەخێوکردنی منداڵانی بێ‌سەرپەرشت ٢. جێ پەروەرشت‌دان ‹پرورشگاه اسب: پەروەرشتگای ئەسپ›.

**پرورشی** / parvarešî/: *صفت.* ١. پەروەرشتی ‹کار پرورشی: ئاکاری پەروەرشتی› ٢. بارهاتوو؛ راهاتوو ‹جوجەی پرورشی: جووچکی بارهاتوو›.

**پروژکتور** / p(o)rojektor/، ـها/: [فرانسوی] /*اسم.* پرۆژیکتور؛ ئامرازی نیشاندانی فیلم و سلاید.

**پروژه** / p(o)roje/، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* پرۆژە؛ گەڵاڵە؛ بناغە دانان بۆ کارێکی گرینگ و بە بەهرە.

**پروستات** / porostāt, p(e)rostāt/: [فرانسوی] /*اسم.* پروستات؛ لکی ژێر میزدانی پیاوان: **پُرُستات**

**پروسترویکا** /prostroykā, porosteroykā/: [؟]/*اسم.* پرۆستروێکا؛ سەرجەمی بەرنامەکانی گۆرباچوف، ئاخر رێبەری سۆڤیەت، بۆ بەدیهێنانی گۆڕانکاری رامیاری و کۆمەڵایەتی لەو وڵاتەدا.

**پروسه** / p(e)rose/، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* رەوت؛ رەوتانە؛ رەهەند.

**پروفرما** / p(o)roformā/، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* پێش‌فاکتۆر؛ بەرگی نیشاندەری نرخ و تایبەتیگەلی کاڵا: **پُرُفرما**

**پروفسور** / porofosor/: [فرانسوی] ☜ **پُرُفُسُور**

**پروگرام** / porog(e)rām, p(e)rogrām/: [فرانسوی]/*اسم.* بەرنامە؛ ریچ.

**پرولتاریا** / p(o)roletāryā/: [فرانسوی] /*اسم.* پرولیتاریا؛ کرێکارانی پیشەسازی؛ چینێکی کۆمەڵایەتی کە ئەندامەکانی لە رێگەی فرۆشتنی هێزی کاری

خـۆوە، واتـا وەرگـرتنی مـز لـەبـەرابـەری کارەوە دەژین *پرۆلتاریا

**پرولتـر** / p(o)roleter، ـهـا/: [فرانسوی] صفت. پرولیتر؛ کرێکار: **پرۆلتر**

**پـرومتیم** / p(o)rometiyom/: [انگلیسی]/اسم. پرۆمیتیـۆم؛ تـوخمی کیمیـایی کـانزایی کەمیاب لە دەستەی لانتانیدەکان، بە ژمارە ئـەتـومی ٦١، کـە لـە شـکانی ئورانیـۆم بەدیدێ: ایلینیم

**پرونجـا** / parvancā، ـهـا/: اسم. فایل؛ جێ ڕاگرتنی پەروەندە.

**پرونـدان** / parvandān، ـهـا/: اسم. پووشەدان؛ جێ ڕاگرتنی پووشە.

**پرونـده** / parvande، ـهـا/: اسم. پـەروەنـدە؛ دۆسـیە؛ هـەڤـنـڤیس؛ کۆمـەڵـە قاقـەزی نووسـراو لـە بـارەی کـەسێک یـا کارێکـەوە ‹پرونده‌ی تحصیلی: پەروەندەی خوێندکاری›.

**پرونـده‌سـازی** / parvandesāzî، ـهـا/: اسم. [کنایی] پـاپۆشدووری؛ کـار و ڕەوتی پـاپۆش دروسـتکـردن؛ کۆکردنـەوەی بـەڵـگەی درۆینە بۆ تووش کردنی کەسێک.

**پرویـزن** / parvîzan، ـهـا/: اسم. [ادبی] ١. پاڵـۆ؛ پاڵـێو؛ پاڵـێوک؛ پـەرزەوانـە؛ سـافی ٢. ئـاوکێش؛ ئاشپاڵـۆ؛ نانـەشـان؛ نانـەشـانە؛ تـەینجـە؛ تـەیـژ؛ سـەلـە ٣. [نامتداول] هێـلەک؛ ئێـلەک؛ هێـلەکـە ٤. وێچن؛ وێچنە.

**پـروین** / parvîn/: اسم. ١. [نجوم] کـۆ؛ پـەروین؛ سـورەییـا؛ ئـەسـتێرە شـەش دانەییەکـانی ئاسمـان: **خوشـەی پـروین؛ ثُریّـا** ٢. [ادبی] فرمێـسک؛ ئـەسـرین؛ هـەرەس؛ هەسر؛ ئرمس؛ ئەسر؛ هەرسی.

**پره** / parre، ـهـا/: اسم. ١. پـەڕە؛ پـەل؛ پـەرک ‹پره‌ی آسیاب: پەڕەی ئاش› ٢. پەڕ؛ پەل.

▣ پرەی بینی: بەڵگی لووت؛ پەلی کەپۆ.

پـرەی گـوش: نـەرمـەی گـوێ؛ نـەرمـەی گوێچکە؛ بەلگ گوێچە؛ بەلگێ گۆه.

▣ پـره زدن: دەورەدان؛ دەوردان؛ ئاڵـقەدان؛ پاپۆکـەدان؛ پـەپکـە بـەسـتن؛ ڕیـز بـەسـتن بەدەوری شتێکدا.

**پرهـون** / parhûn، ـهـا/: اسم. [ادبی] جـەغـز؛ بز؛ گاخ؛ دایەرە.

**پرهیـز** / parhîz/: اسم. پـارێز؛ پـەرهێـز؛ پیـەرێـز؛ بـەهرێـز؛ پـەرهیـز؛ دەژ؛ خۆپـارێزی؛ دوورەپـەرێـزی؛ خۆبـوێری؛ کـار یـان ڕەوتی تەکینەوە لـە کـەسێک یـان شـتێک ‹پرهیز از دروغ؛ پرهیز از گوشت: تەکینەوە لە درۆ؛ پارێز لە گۆشت›.

▣ پرهیـز دادن: پـارێز دان؛ قـەدەغـەکـردن؛ لـێبـواردن ‹دکتر مرا از خوردن گوشت پرهیز داده است: دوکتۆر لـە خـواردنی گوشـت پارێزی داوم›. هەروەها: **پرهیز داشتن**

پرهیز شکستن: پارێز شـکاندن؛ پـارێز مـارەی ‹بـه خـاطر مهمانـان پرهیـز را شکستن: لـە بـەر میوانەکان پارێزەکەت شکێنە›.

پرهیـزکـردن: پـارێزکردن؛ پـەرهیزکـردن؛ خـۆ بـواردن؛ تـەکینـەوە ‹از دروغ پرهیز می‌کرد: لە درۆ خوی دەبوارد›.

**پرهیزانـدن** / parhîzāndan/: مصدر. متعدی. [ادبی]// **پرهیزاندی**: پێپاراستت؛ **مـی‌پرهیزانـی**: پـێدەپـارێزی؛ **بپرهیـزان**: پـێبپـارێزە// پێپاراستن؛ لـێبـواردن؛ لـێ قـەدەغـەکـردن. هەروەها: **پرهیزاندنی**

**پرهیزانـه** / parhîzāne/: اسم. پارێزانـە؛ خۆراکی نەخۆشێک کە پارێزی هەیە.

**پرهیـزدار** / parhîzdār/: صفت. پـارێزدار؛ بـەپـارێز؛ خـاوەن دۆخێکـی (وەک نـەخۆشـی) کە پێویستە خـۆی لـە شـتێک یـان شـتانێک بپارێزێ.

**پرهیزکـار** / parhîzkār، ـان/: صفت.

پارێزکار؛ پەرهێزکار؛ دژکام؛ خۆبوێر لە کاری ناشایست: **پرهیزگار**

**پرهیزکاری** / parhîzkārî/: *اسم.* پارێزکاری؛ خۆپاریزی؛ دشکردن؛ خۆبواردن لە کاری ناشایست: **پرهیزگاری**

**پرهیزگار** / parhîzgār/ ☜ **پرهیزکار**

**پرهیزگاری** / parhîzgārî/ ☜ **پرهیزکاری**

**پرهیزیدن** / parhîzîdan/: *مصدر. لازم.* *[ادبی]*// **پرهیزیدی**: خۆتبوارد؛ **میپرهیزی**: خۆت دەبوێری؛ **بپرهیز**: خۆت ببوێرە// خۆ بواردن؛ خۆ لادان؛ خۆ پاراستن؛ وێپارێزنەی؛ دوورگرتن لە کەسێ، شتێ یان کارێک. هەروەها: **پرهیزیدنی**

**پری** / parî، ـها؛ ـان/: *اسم.* پەری: ١. *[فرهنگمردم]* جنۆکەی مێینە ٢. جوانی بێوێنە (لەمەڕ کچ و ژنەوە) ٣. *[فرهنگمردم]* فریشتە؛ جوانی باڵداری خەیاڵی؛ بوونەوەرێکی یەکجار جوانی کارچاک و خاوەن هێزێکی نائاسایی و لەڕادەبەدەر.

◙ پری دریایی: پەری دەریایی؛ بوونەوەرێکی خەیاڵی ناو ئاوان کە لەشی لە خوارەوە ماسیە و لە سەرەوە وەک کچێکی جوانە.

**پری** / porî/: *اسم.* پڕی؛ تەژی؛ پەڕی؛ پڕاوپڕی؛ سەرڕێژی؛ لیپی؛ دۆخ و چۆنیەتی پڕ بوون ‹خواب آشفته مال پری معده است: خەوی ئالۆز هی پڕی زگە›.

**پریاخته** / poryāxte، ـها؛ ـگان/: [فارسی/ ؟] *صفت.* پڕشانە؛ خاوەن پێکهاتەیەک بە زۆرتر لە یەک، تا دەگاتە ملیۆنان شانە. بەرانبەر: **تکیاخته** ‹جانور پریاخته:گیانلەبەری پڕشانە›.

**پریپیکر** / parîpeykar، ـها؛ ـان/: *صفت.* *[ادبی]* بلارمان؛ دەلال؛ چەلەنگ؛ شۆخ و شەنگ؛ پەری پەیکەر (سەبارەت بە ژن و کچ).

**پریچه** / parîče/: *اسم.* گژ و لاسکەی درێژ و رووش (وەک ساقەتەی داری خورما).

**پریچهر** / parîčehr/ ☜ **پریچهره**

**پریچهره** / parîčehre، ـها؛ ـگان/: *صفت.* جوان؛ پەریچێر؛ چەلەنگ؛ شەپال؛ خوشێک؛ دەلالی شەپال؛ شێوەپەری؛ خاوەنی ڕوومەتی زۆر جوان (بۆ کچ و ژن): **پریچهر**

**پریدگی** / parîdegî، ـها/: *اسم.* بزرکاوی؛ پەڕیاگی؛ پەڕیاوی؛ پەڕاوی؛ پەڕیگی؛ پەڕیوی؛ چۆنیەتی فەوتاوی یان لەدەس چوویی بەشێک یان پارچەیەک ‹رنگ پریدگی؛ پریدگی لبەی استکان: ڕەنگ بزرکاوی؛ پەڕیاگی دەم ئیسکان›.

**پریدن** / parîdan/: *مصدر. لازم. متعدی.* //**پریدی**: پەڕیت؛ **میپری**: دەپەڕی؛ **بپر**: بپەڕە// ☐*لازم.* ١. پەڕین؛ پەڕان؛ باڵگرتنەوە؛ فڕین؛ فڕان؛ هەڵفڕین؛ باڵۆگرتن؛ پەروازکردن؛ پڕەی؛ فڕای؛ هاتوچووکردن بە هەوادا ٢. ڕەوینەوە؛ پسان؛ پەڕین؛ پڕەی؛ پڕای؛ زڕان ‹پریدن خواب: ڕەوینەوەی خەو› ٣. پەڕین؛ لێوە بوون؛ لێپەڕین؛ بەر بوونەوە و پەرتەوازە بوون؛ شکان و پەڕانی شتێک یان بەشێ لە شتێک ‹پریدن لبەی استکان: پەڕینی لێوارەی ئیسکان› ٤. *[گفتاری]* بازدان؛ دەرچوون؛ هەڵبەزین؛ پەڕان؛ بەرشیەی؛ بە لەز و بەز بزوان ‹بپر یک لیوان آب بیاور: بازدە پەرداخێک ئاو بێنە› ٥. پەڕین؛ پەڕان؛ پڕەی؛ نەمان و لە نێو چوون بە بۆنەی هۆکارگەلی کیمیایی و فیزیکیەوە ‹پریدن رنگ پارچە: پەڕانی ڕەنگی پارچە› ٦. پەڕینەوە؛ بازدان؛ بازهاویشتن؛ قەڵەمباز دان؛ پڕەی؛ پڕای؛ قەفازتن؛ بە سەر لەمپەراندا بازدان ‹از دیوار پریدن: لە

دیوار پەرینەوە› ٧. ڕاپەڕان؛ دەرپەڕان؛ داچڵەکان؛ ڕاچەنین؛ چڵکیایرە؛ لەپڕ پەڕان و گۆڕانی نائاسایی لە ڕەوتێکدا ‹از خواب پریدن؛ از جا پریدن: لە خەو ڕاپەڕان؛ لە جێگەوە دەرپەڕان› ٨. فڕان؛ فریەی؛ فریای؛ لێدان؛ تووشی فڕکە هاتن ‹پریدن پلک چشم: فڕینی چاو› ◻ متعدی. ٩. [گفتاری] هەڵتۆزان؛ بەگژدا چوون؛ هەڵشاخان ‹بە این و آن پریدن: بەگژ ئەم و ئەودا چوون›. هەروەها: **پریدنی**

■ صفت فاعلی: **پرنده** (ـــ)/ صفت مفعولی: **پریده** (پەڕیو)/ مصدر منفی: **نَپریدن** (نەپەڕین)

**پریرخ** / parîrox، ـان/: صفت. جوان؛ قەنج؛ کەلەش؛ کەلان؛ پەری‌شێوە؛ پەری ڕوومەت؛ مێوینەی جوان و چاک؛ پەری‌ڕوخسار.

**پریرو** / parîrû، ـیان/: صفت. جوان؛ کەلەش؛ کەلان؛ پەری‌ڕوو؛ مێوینەی جوان چاک.

**پریروز**[1] / parîrûz/: اسم. پێرەکە؛ پێرێ؛ پەرێ؛ دوو ڕۆژی پێش ‹پریروز اول سال بود: پێرەکە سەرەتای ساڵ بوو›.

**پریروز**[2]: قید. پێرێ؛ پێرەکە؛ پەرێکە؛ پەرێ؛ پەرێنە؛ پێرنا؛ لەپێرەکەدا؛ لەپێرێدا ‹برادرم پریروز رفت: براکەم پێرەکە چوو›.

**پریز** / pirîz, p(e)rîz، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پریز؛ ئامرازێک (زیاتر بە دیوارەوە) جێ دوو شاخە یان سێ شاخەی کەرستە کارەباییەکان.

**پریزاد** / parîzād، ـان/: اسم. [ادبی] پەریزاد؛ پەریزادە؛ پەریزا: ١. مێوینەی جوان‌چاک ٢. زادەی فریشتە.

**پریسا** / parîsā/: صفت. [ادبی] پەری‌ئاسا: ١. وەکوو پەری؛ پەریوار؛ لە شکڵ و بیچمی پەری ٢. پەری‌شێوە؛ وەک خوو و خدەی پەری.

**پریش** / parîš/: صفت. [ادبی] پەشێو؛ پەرێشان؛ بڵاو؛ دڵ‌بەخەم؛ پەژێو؛ پەژار؛ خەمین؛ تەمین.

**پریشان** / parîšān/: صفت. پەرێشان؛ شێواو: ١. شپرز؛ بێ‌سەر و بەر؛ تێکچوو؛ ئاڵۆز؛ تێک‌هەڵچوو؛ ژوولیاگ؛ بزگ؛ شڵەژاو ‹خانەی پریشان: ماڵی شێواو› ٢. [کنایی] حاڵ‌خراپ؛ پەشێو؛ خەمبار؛ نیگەران؛ ئەرامەندە؛ داماو؛ شاپرزە؛ شپرزە؛ زوێن؛ حاڵ‌شڕ و لێقەوماو؛ خەمگین ‹بەنظر پریشان آمد: پەرێشان هاتە بەرچاو›.

◙ پریشان شدن: ١. شپرزە بوون؛ شەوشین؛ پەخشان بوون؛ بڵاو بوون؛ هەڵشێویان؛ تێکچوون؛ تەڕا و بەڕا بوون؛ لە تەکووزی ترازان؛ لە ڕێک‌وپێکی کەوتن؛ پڕ و پەشێو بوون ‹وضع کارخانە خیلی پریشان است: دۆخی کارخانە زۆر شپرزە بە› ٢. [کنایی] شڵەژان؛ خەمبار بوون؛ نیگەران بوون؛ زویر بوون؛ تووشیاری ترس و نیگەرانی هاتن ‹از شنیدن این حرف خیلی پریشان شد: بە بیستنی ئەم قسەیە زۆر سڵەژا› ٣. هەڵژووژیان؛ پەشێو بوون؛ زویر بوون؛ داماو بوون؛ ئەرامەندە بیەی؛ لێقەومان و بەدبەختی بەسەردا هاتن ‹بیکار و پریشان شده بود: بێکار و داماو ببوو›. هەروەها: **پریشان کردن**

پریشان گفتن: [ادبی] هەڵیت‌وپەڵیت وتن؛ هەرزە دوین؛ هەڵە وتن؛ هاتەران‌ــپاتەران گوتن؛ پەرێشان واتەی.

**پریشان‌حال** / parîšānhāl/: [فارسی/ عربی] صفت. [مجازی] پەشێو؛ پەژێو؛ پڕ و پەشێو؛ شێواو؛ شپرز؛ شپرزە؛ شپرزیاگ؛ شپرێو؛ شەوێق؛ شەپل؛ بێ سەر و بەر؛ حاڵ‌پەرێشان؛ کەلەلا؛ ناکۆک؛ ناساز؛ ناتەواو؛

زار؛ لێ‌قەوماو.
پریشان‌خاطر / parîšānxāter/: [فارسی/ عربی] صفت. [مجازی] بیربڵاو؛ خاترپەرێشان؛ فکرپەرێشان؛ بیرئاڵۆز؛ خەیاڵاوی؛ دڵ‌زویر ‹پریشان‌خاطران رفتند در خاک: بیربڵاوان بە ناخی ئاخا ڕۆین›. هەروەها: **پریشان‌خیال؛ پریشان‌دل**
پریشان‌روزگار / parîšānrûz(e)gār/: صفت. [ادبی] ڕۆژڕەش؛ ڕۆژپەرۆش؛ ڕۆژکوێر؛ پەریشان ڕوژگار.
پریشانی / parîšānî، ـها/: اسم. پەرێشانی شپرێوی؛ شەوشی؛ پەشێوی؛ شێواوی؛ قەبزی؛ ئەنووسی؛ زەوین: ١. شپرزەیی؛ ئاشفتەیی؛ شڵەژاوی؛ شێواوی؛ ئاڵۆزی ‹پریشانی کار: پەرێشانی کار› ٢. پەژارەیی؛ نیگەرانی و خەم و خەفەت؛ زویر و زگاری؛ زوور و زویری ٣. دەسکورتی؛ تەنگدەستی؛ هەژاری؛ نەداری؛ بێ‌ئەنوایی.
پری‌شاهرخ / parîšāhrox/: اسم. زەردی شامی؛ هەنجیرخۆرە؛ مەلێکە تیژ فڕ لە تیرەی چۆلەکە.
پریشب / parîšab/: اسم. پێرەشەو؛ پێرێشەو؛ پەرێشەوێ؛ پێرناشەو؛ شەوادیتر؛ شەوی بەر لە دوێشەو ‹مهمانی پریشب چطور بود؟: میوانی پێرەشەو چۆن بوو؟›.
پریشب: قید. پێرەشەو؛ پێری‌شەو؛ پەرێشەوێ؛ لەپێرەشەودا ‹پریشب رفتیم مهمانی: پێرەشەو چووین بۆ میوانی›.
پریشیدن / parîšîdan/: مصدر. لازم. متعدی. [ادبی]// **پریشیدی: پەشۆکای؛ می‌پریشی:** دەپەشۆکی؛ _// □لازم. ١. پەشۆکان؛ شەمزان؛ شەوشین؛ پەشۆکیەی؛ پەشۆکیای؛ شێوان؛ راچەنین؛ شڵەژان؛ شێویەی؛ پەرێشان بوون؛ سەر لێ‌شێوان □ متعدی. ٢. [قدیمی] پەشۆکاندن؛ شەمزاندن؛ شێواندن؛ شڵەژاندن؛ پەرێشان کردن؛ سەر لێ‌شێواندن؛ پەشۆکنەی؛ پەشۆکنای؛ شێونەی.
■ صفت مفعولی: **پریشیده** (پەشۆکاو)
پریمتر / perîmetr، ـها/: [انگلیسی] اسم. بینایی‌پێو؛ ئامرازی نیشاندەری سۆمای چاو.
پریمتری / perîmetrî/: [انگلیسی] اسم. بینایی‌پێوی؛ دەرخستنی سۆمای چاو.
پریموس / perîmûs، ـها/: [از انگلیسی] اسم. پریمووس؛ پریمۆز؛ پەرەمێزە؛ جۆرێک چرای خۆراکپەزی.
پرینت / pirînt, p(e)rînt/: [انگلیسی] اسم. ١. چاپ ٢. /ـها/ چاپ‌کراوە؛ دەقی لە چاپ دراو.
پرینتر / pirînter, p(e)rînter/: [انگلیسی] ☜ **چاپگر**
پریوار / parîvār، ـان/: صفت. پەریانە؛ پەریسا؛ بە ئاکاری وەکوو پەری.
پریوش / parîvaš، ـان/: صفت. زۆرجوان؛ پەریانە؛ کەلەش؛ وەکوو پەری؛ پەری‌شێوە (بۆ کچ و ژن).
- پز / paz/: پیواژە. — پەز؛ - پێژ؛ -کوڵ: ١. کوڵێن؛ پەزێن؛ گرین ‹آرام‌پز؛ آشپز؛ زودپز: ئارام‌پەز؛ ئاشپەز؛ زووبەز› ٢. کوڵاو؛ گریا ‹نیم‌پز: نیوەکوڵ›.
پز / poz/: [فرانسوی] اسم. ١. دەق؛ دوخت؛ رازاوەیی جل و بەرگ ‹خوب بە پزش رسیدە: باش خۆی داوە لە دەق› ٢. دەمار؛ فیز.
پزا / pazā/: صفت. خووش‌کوڵ؛ بە تایبەتمەندی خێرا و باش کوڵان.
پزائی / pazā'î/ ☜ **پزایی**
- پزان / pazān/: پیواژە. ١. - ڕەسان؛ - ڕەسین؛ گەیین؛ یاوەی؛ گەییشتن؛ وەرزی پێ‌گەییشتنی میوەیەک ‹میوەپزان: میوەڕەسان› ٢. لێنان؛

کولان؛ کولاندن؛ گرینەی؛ وەش کەردەی ‹حلواپزان: هەڵوا لینان›.

**پزایی** / pazāyî/: اسم. خوەش کولی؛ خۆشپەزی: **پزائی**

**پزشک** / pezešk, pezešg، ـها؛ ـان/: اسم. بژیشک؛ پسیزک؛ پزیشک؛ پزیسک؛ دوکتور.

**پزشک بالینی**: بژیشکی گشتی؛ بژیشکێ کە خاوەن ئەزموونی کردەوەیی لە ناسین و دەرمانی نەخۆشییەکانە، بە گشتی: **پزشک عمومی**

**پزشک خانواده**: بژیشکی بنەماڵە.

**پزشک شخصی**: بژیشکی کەسی؛ بژیشکی تایبەتی بۆ نەخۆشێک.

**پزشک عمومی** ☜ **پزشک‌بالینی**

**پزشک قانونی**: بژیشکی قانوونی؛ بژیشکی تایبەت بۆ سەر دەرکردن لە چۆنیەتی زامدار بوون یا کوژرانی مرۆ.

**پزشکی** / pezeškî, pezešgî/: اسم. بژیشکی: ١. کاری بژیشک؛ زانستێ کە دەپەرژێتە سەر ناسین و دەرمان‌کردنی نەخۆشییەکان ٢. لقێک لە فێرکاری زانستگا لە بواری ناسین و دەرمان‌کردنی نەخۆشیەکانەوە.

**پزشکی قانونی**: بژیشکی قانوونی؛ لقێ لە زانست و شێوازی بژیشکی کە سەر دەرکردن لە چۆنیەتی زامدار بوون یان کوژرانی مرۆی بە ئەستۆیە.

**پزشکیار** / pezeškyār, pezešgyār، ـان/: اسم. بژیشکیار؛ بژشکیار؛ هاریکاری پزیشک؛ تیمارکەر؛ برین‌پێچ.

**پزو** / pezo/: [اسپانیول] اسم. پێزۆ؛ یەکەی پارەی ولاتانی ئارژانتین، ئورۆگوە، دومینیکەن، شیلی، فیلیپین، کولومبیا، کووبا، گینەی بیسائۆ و میکزیک.

**- پزی** / pazî/: پیوازه. ١. ـ لێنان؛ ـ پێژان؛ ـ کولێنی؛ ـ پێژی؛ کاری کولاندن ‹خوراک‌پزی: چێشت لینان› ٢. ـ پەزی؛ جێگای کولاندنی شتێک ‹کلەپزی: سەر و پێ پەزی›.

**پژ** / paj/: اسم. ١. ئاڵشک؛ ئاڵشت؛ ئاڵشتە؛ شەڵتە؛ سیخوار؛ سووخار؛ سیخ؛ سووخ؛ خووسار؛ خووس؛ خیسار؛ خویسە؛ خوسیک؛ خوویس؛ خوزە؛ خازی؛ خوس؛ زوقم؛ قورۆ؛ قڕ؛ قڕاف؛ خۆیز؛ خوویز؛ خوز؛ بەرفۆک؛ ئەڵماسە؛ سەرماوردە؛ پژ؛ پەژ؛ پەژم؛ وردیلە بەفری پەرژ و بڵاوی کاتی سەرما و سۆڵە کە بە دەم باوە هەڵدەسوورێ ٢. کەل؛ ملە؛ ملەگا؛ گەردەنە؛ ڕێگای پێچ- پێچ بە کێودا.

**پژمان** / pejmān/: صفت. [ادبی] دڵ‌سەرد؛ دڵ‌مردوو؛ خەمین؛ خەمبار؛ زگار؛ کز؛ پەژار.

**پژمردگی** / pajmordegî/: اسم. ژاکاوی؛ شەمزاوی؛ پەژمراوی؛ پەرمووچاوی؛ سیسی؛ سیسیاگی؛ داچەکاوی؛ ژەڵم؛ مەل‌کزی ‹سرما موجب پژمردگی برگها شد: سەرما بوو بە هۆی سیسی گەڵاکان›.

**پژمردن** / pajmordan/: مصدر. لازم. //**پژمردی**: ژاکای؛ **مـی‌پژمری**: دەژاکی؛ **پژمرده‌شو**: بژاکێ// ژاکان؛ ژاکیەی؛ ژاکیای: ١. سیس‌هەڵگەڕان؛ سیسان؛ سیسیان؛ سیس بوون؛ هەڵچرچان؛ پەژمەرین؛ چەرمسین؛ چەلمسین؛ ژۆلیان؛ چلمیسان؛ پەژمەریەی؛ سیسیەی؛ گەچلان؛ دوژان؛ پەرمووچان ‹پژمردن گل: ژاکانی گول› ٢. [مجازی] شەمزان؛ شەمزین؛ شەمسان؛ دڵ‌ئێشان؛ دڵ‌دامان. هەروەها: **پژمردنی**

■ صفت مفعولی: **پژمرده** (ژاکاو)/ مصدر منفی: **نَپژمردن** (نەژاکان)

**پژمرده** / pajmorde/: صفت. ژاکاو؛ چرمس؛

چلمس؛ چرووسیا؛ سیس؛ هەڵچرچاو؛ جلوا؛ زەردەڵە؛ سیسەڵە؛ پەژمراو؛ پوژمور؛ پەرمووچاو؛ پەرمووچ؛ پەژمرە؛ پژلمە؛ لوس؛ دوژ؛ کز؛ ژولسە؛ ژەڵم؛ ژەلمسە؛ پێژیاو؛ داچەکاو؛ گەوزەکەوتە؛ ئەتچریسکیای؛گەچڵ؛ گەچلاو: ١. بێدەماخ ‹برگهای پژمرده: گەلا پەژمراوەکان›
٢.*[مجازی]* شەمزاو؛ خەمگین ‹دلهای پژمرده: دڵگەلی ...کاو›. هەروەها: **پژمرده بودن؛ پژمرده شدن؛ پژمرده کردن**

پژواک / pejvāk، ـها/:*اسم.* پێژن؛ زایەڵە؛ گومنی؛ زایلە؛ دەنگدانەوە.

پژول / pajûl/ ☜ استخوان قاب، **استخوان**

ـ پژوه / pajûh, pujûh, pejûh/: *پیوازه.* ـتۆژ؛ تۆژەر؛ ـکۆڵ؛ ـکۆڵەر؛ لێکۆڵەر؛ تۆژەرەوە ‹دانش‌پژوه: زانستتۆژەر›.

پژوهانه / pajûhāne, pujûhāne, pejûhāne، ـها/:*اسم.* تۆژەرانە؛ ئەو پاداشە کە لە بەرانبەر تۆژینەوەوە بە لێکۆڵەر دەدرێت: **حق تحقیق؛ حق‌التحقیق**

پژوهش / pajûheš, pujûheš, pejûheš، ـها/:*اسم.* هێرە؛ داباش؛ هەمن؛ منێ؛ پەیجۆری؛ بنجۆری؛ مینە؛ کار و ڕەوتی تۆژینەوە؛ لێکۆڵینەوە؛ کۆڵینەوە؛ ڤەکۆڵان؛ لێتۆژینەوە؛ کۆڵانەوە؛ هووراندن: ١. گەڕان و وەچوونەوە لە مەڕ دروستی و نادروستی بابەتێکەوە ‹کارشناسان دربارەی علت بیماری به پژوهش پرداختند: کارناسەکان لەمەڕ هۆی نەخۆشینەوە کەوتنە تۆژینەوە› ٢. دادرەسی؛ ڤەچوون؛ پێداچوونەوە ‹نامبرده ده روز مهلت دارد تا از حکم صادره پژوهش بخواهد: ناوبراو دە ڕۆژ ماوەی هەیە کە لە بڕیاری دەرچوو داوای تۆژینەوە بکا›.

پژوهشخواه / pajûhešxāh، ـان/:*اسم.* *[حقوق]* تۆژینەوەخواز؛ همنخاز؛ داباشخواز؛ کەسێ کە داوای تۆژینەوەی کردووە.

پژوهشکده / pajûheškade، ـها/:*اسم.* تۆژینگە؛ جێگای لێکۆڵینەوە؛ دامەزراوەیەکی تۆژینەوەیی کە لانیکەم لە سێ گرۆی تۆژینەوەیی پێک هاتووە.

پژوهشگاه / pajûhešgāh، ـها/:*اسم.* تۆژینگا؛ یانەی تۆژینەوە؛ دامەزراوەیەکی تۆژینەوەیی سەربەخۆ کە لانی کەم سێ تۆژینگەی هەیە.

پژوهشگر / pajûhešgar، ـها؛ ـان/:*اسم.* تۆژەر؛ تۆژەرەوە؛ پەیجۆر؛ کۆڵەرەوە؛ هێرەکار؛ تۆژین؛ لێکۆڵەر؛ تۆژینەکار.

پژوهشی / pajûhešî/: *صفت.* تۆژینەوەیی ‹مؤسسەی پژوهشی: دامەزراوەی تۆژینەوەیی›.

پژوهنده / pajûhande، ـها؛ ـگان/: *صفت.* تۆژەر؛ تۆژەرەوە؛ وەدۆزەر؛ لێکۆڵەر؛ کۆڵەرەوە.

پژوهیدن / pajûhîdan/: *مصدر. لازم.* تۆژینەوە؛ لێکۆڵین؛ لێتۆژین؛ وەکۆڵین؛ هووراندن؛ منێکرن؛ هلکەوشاندن؛ هلکەواشتن.

■ صفت فاعلی: **پژوهنده** (لێتۆژەر)/ صفت مفعولی: **پژوهیده** (لێتۆژراو)

پس[1] / pas/:*اسم.* پشت؛ دوا؛ پاش؛ پەشتی؛ دما ‹پس سر: پشت سەر›.

▣ پس پرده: *[کنایی]* نهێنی؛ نادیار؛ پێواری؛ ژێرکاسە؛ پشت لە خەڵکی؛ بەدزی خەڵکەوە؛ دوور لە چاوی خەڵک؛ پشت لە ڕوویی ‹توافق پس‌پرده: پێکگەییشتنی نهێنی›.

پس سر: *[کالبدشناسی]* پشتە سەر؛ دوای سەر؛ پەشتۆ سەرەی.

پس سری: پشتەسەر؛ پشتە مل ‹ناحیەی پس سری: شوێنی پشتە سەر›.

پس[2]: *قید.* ١. بەرەو دوا؛ دووربونەوە لە ڕێگە

و لایەک کە مەبەستی بێژەر یان سەرباسە ‹پس می‌رفت: بەرەو دوا ئەچوو› ٢. دوای؛ لەدوای؛ بەدوای؛ دماو؛ شۆنوو؛ لە دوای؛ لە شوێن؛ بە شوێن؛ بەدووی ڕووداوێک؛ لەدوای ڕووداوێک ‹پس از رفتن من: دوای ڕۆیشتنی من› ٣. دوای؛ بە دوای؛ شۆنوو؛ دماو؛ بە شوێن تێپەڕ بوونی ماوەیەکدا ‹پس از دوسال: دوای دوو ساڵ›.

▣ **پس افتادن**: ١. پاش کەوتن؛ دواکەوتن؛ دماکەوتەی ‹دست پیش می‌گیرد کە پس نیفتد: حەولی پێش دەدا با پاش نەکەوێ› ٢. *[گفتاری، کنایی]* کەوتنە پشتا؛ داریانەوە؛ لار بوونەوە؛ لەپڕا مردن؛ ناخلاف مردن ‹بیچارە ناگهان پس افتاد: بەستەزمان لەپڕ کەوتە پشتا›.

**پس انداختن**: *[مستهجن، کنایی]* خستنەوە؛ منداڵ هێنان؛ مناڵ هاوردن؛ زایین؛ وسەیوە ‹هر سال یک بچە پس می‌انداخت: هەموو ساڵێک منداڵێکی ئەخستەوە›.

**پس آوردن**: ١. هێنانەوە؛ هاوردنەوە؛ هەڵگەڕاندنەوە؛ ئاردەیوە ‹همەی کتابها را پس آورد: هەموو کتێبەکانی هێناوە› ٢. هەڵهاوردنەوە؛ ڕشانەوە؛ هۆرئاردەیوە ‹هر چە خوردە بود پس آورد: هەرچێکی خواردبوو هەڵیهاوردەوە›.

**پس بردن**: بردنەوە؛ بەردەیوە ‹کتابی را کە آوردە بود پس برد: ئەو کتێبەکە هێنابووی بردیەوە›.

**پس بودن**: ناحەز بوون؛ تاڵ و تووش بوون؛ ڕەش و تاریک بوون ‹هوا پس است: هەوا ناحەزە›.

**پس خواندن**: تێکدان؛ هەڵشێواندن؛ هەڵوەشاندن؛ سەر لە نوێ خوێندنەوە.

**پس دادن**: دانەوە؛ وەدانەوە؛ ئەوەدەی؛ دایوە: ١. دانەوەی ئەوەی کە وەرگیراوە ‹کتابم را پس داد: کتێبەکەمی داوە› ٢. دەلاندن؛ دەڵینەوە؛ دەڵنایوە؛ دەمنایوە ‹نم پس دادن: شێ دانەوە›.

**پس راندن**: پاشەکشە پێکردن؛ بەرەو دوا بردن؛ بەرەو پاش کشاندنەوە ‹دشمن را پس راندند: دوژمنیان پاشەکشە پێ کرد›.

**پس رفتن**: ١. پاشەکشەکردن؛ بەرەو دواوە چوون؛ کشانەوە ‹همە پیش می‌روند، او پس می‌رود: گشتی بەرەو پێش دەڕوا، ئەو ئەکشێتەوە› ٢. داشکانەوە؛ تەمەران؛ هەندکان؛ کەم بوونەوەی چۆنیەتی شتێک.

**پس زدن**: دانە دواوە؛ دوورەوەکردن؛ دوور کردنەوە؛ دوورەوە خستن؛ کێشانە دواوە؛ دوورەوە وسەی؛ بەردەیوە دما ‹دستش را پس زد: دەستی دا دواوە›.

**پس فرستادن**: هەڵگەڕاندنەوە؛ ناردنەوە؛ هەناردنەوە؛ کیاستەیوە ‹پولی را کە دادە بودم پس فرستاد: ئەو پارەیە دابووم ناردیەوە›.

**پس کشیدن**: پاشەکشەکردن؛ کێشانەوە؛ کێشانە دواوە؛ بەرەو خۆ بردنەوە؛ کێشتەیوە ‹دستش را پس کشید: دەستی کێشاوە›.

**پس گرفتن**: سەندنەوە؛ گرتنەوە؛ وەرگرتنەوە؛ ئەسایوە؛ سانایوە ‹کتابم را پس گرفتم: کتێبەکەم سەندەوە›.

**پس نشاندن**: *[ادبی]* دامرکاندن؛ تەمراندن؛ پاشەکشە پێکردن؛ دانیشاندن؛ نیشنایوە ‹همە را پس نشاند: هەمووی دامرکاند›.

**پس نشستن**: نیشتنەوە؛ پاشەکشەکردن؛ دامرکان؛ نیشتەیوە ‹سیل پس نشست: لافاوەکە نیشتەوە›.

**از پس کاری برآمدن**: دەرەقەت کارێک

هاتن؛ دەرعەوەی کاریٚ هاتن؛ چار هاتن؛ چارکردن؛ پیٚویٚران؛ دەرۆست هاتن؛ یارەی ‹من از پس این بچەها برمی‌آیم: من حەری ئەم مندالانە ناکەوم›. هەروەها: از **پس هم برآمدن**

**پس** ¹: *حرف.* سا؛ کەوابوو؛ کەوایە؛ خۆ؛ خر؛ کەچی؛ ئیتر؛ دیتر؛ دە؛ ئەدی؛ ئینجا؛ کەواتا؛ کەواتە؛ ئینجارەکی؛ ئیجا؛ ئینجاکوو؛ ئینجارەکانیٚ؛ کەوابیٚ؛ ئەی؛ ئنی؛ ئەنی؛ پا؛ هەلە؛ چە؛ نەخو؛ دەسا؛ دەسادەی؛ جا: ۱. هەر لەم ڕووەوە؛ لە ئاکامی ئەوەی کە گوترا؛ هەر بەم بۆنەوە ‹پس معلوم شد چه کسی مرد است: سا دەرکەوت کیٚ پیاوە› ۲. لەم دۆخەدا؛ لە وەها دۆخێکدا ‹پس من می‌روم؛ پس او را هم ببر: کەوابوو من دەڕۆم؛ کەوابوو ئەویش بەرە›.

**پس ـ** ²: *پیشواژە.* ۱. پەسە ـ ؛ پەسر ـ ؛ بەسر ـ ؛ بەتر ـ ؛ پەسەر ـ ‹پس‌پریروز: پەسەپیٚرەکە› ۲. پاشە ـ ؛ پاش ـ ؛ دوا ـ ؛ دما ـ ؛ پەس ـ ‹پس‌انداز: پەسەکەوت›.

**پسا ـ** / pasā/: *پیشواژە. [ادبی]* دوا؛ دما؛ پاشە ـ ‹پساچین؛ پسامدرن: پاشەچن؛ پاشەمودیٚڕن›.

**پساب** / pasāb، ـها/: *اسم.* ۱. پاشاو؛ پاشاراو؛ پاژاو؛ وازاو؛ پانیاو؛ قونتاو؛ ڕۆقاو؛ ڕۆقە؛ نیشاو؛ ئاویٚ کە شتێکیان پیٚ شۆردبیٚ ۲. ژاراو؛ چلکاو؛ فازلاو.

**پساچین** / pasāčîn، ـها/: *اسم.* پاشەرۆک؛ پاشارۆ؛ شارۆ؛ پاشەبەر؛ پاشەبەرە؛ قورف؛ خاپەرۆک؛ خرتک؛ پاشەچن؛ پاشەڕن؛ بەر یان میوەیەک کە دوای بەر چنینەوە، لە بەر نەگەییوی یان نادیاری، لە قەدی دارەکەوە مابێتەوە.

**پس‌آزمون** / pasāz(e)mûn، ـها/: *اسم.* پاشئەزمە؛ دوایەمین ئەزموون؛ تاقیکردنەوەیەک بۆ سەنگاندنی پلەی پێشڕەوتی فێرکار دوای تەواو بوونی خولی فێرکاری.

**پس‌افت** / pasoft, -'oft/: *اسم.* تەفرە: ۱. دواکەوتوویی؛ بەجیٚماوی؛ دیٚری؛ پاشخست؛ پاشکەوت ۲. حەواڵە بە گەواڵە؛ ئەوەی دانەوەی لە کاتی خۆیدا نەبووە.

**پسامدرن** / pasāmodern/: [فارسی/ فرانسوی] *صفت.* پاشنویٚ؛ پاشەمودیٚڕن: **پُست‌مدرن**

**پسامدرنیست** / pasāmodernîst، ـها؛ ـان/: [فارسی/ فرانسوی] *صفت.* پاشنوێخواز: **پست‌مدرنیست**

**پسامدرنیستی** / pasāmodernîstî/: [فارسی/ فرانسوی] *صفت.* پاشنوێخوازی: **پست‌مدرنیستی**

**پسامدرنیسم** / pasāmodernîsm/: [فارسی/ فرانسوی] *اسم.* پاشنوێخوازی؛ ئۆگرەتی و خوازیاریەک لە ویٚژە، هونەر، نژیاری و بیری سالانی دوایی چەرخی بیستەم، لە بەرانبەری نوێخوازیەوە: **پست‌مدرنیسم**

**پسان‌پریروز** [1] / pasānparîrûz/: *اسم.* پەسەرپەسرپیٚرەکە؛ سەرپەراوەریٚکە؛ پاشان‌پیٚری؛ پەر پەراوەریٚ؛ چوار ڕۆژ لەمەو پیٚش: **پسین‌پریروز**

**پسان‌پریروز** [2]: *قید.* پەسەرپەسرپیٚرەکە؛ لە سەرپەراوەریٚکەدا؛ لە پەسەرپەسرپیٚرەکەدا؛ پاشان‌پیٚری؛ پەرپەراوەریٚ: **پسین‌پریروز**

**پس‌انداز** / pasandāz، ـها/: *اسم.* پاشەکەوت؛ پاشەکەفت؛ پەزمەندە؛ پەسمەندە؛ پەسەنناز؛ بازمان؛ لیٚبەجیٚماو؛ گلەودریاگ؛ کۆوەکراو؛ نیاتە؛ نۆتە؛ پاشقل؛ گردوکۆ؛ قەبور؛ پاشەناز؛ پاشەناژ؛ پاشخراو؛ کار و ڕەوتی دانان بۆ دوارۆژ.

▣ پس انداز مسکن: پاشەکەوتی خانوو؛ پاشەکەوت خستن بۆ کڕینی خانوو.

▣ **پس انداز داشتن**: پاشەنازدار بوون؛ پاشەکەوت هەبوون؛ پاشەدار بوون ‹مقداری پس‌انداز داشتم، به او دادم: هێندێک پاشکەوتم هەبوو، پێم دا›.

**پس انداز شدن**: پاشەکەوتن؛ پاشەکەوت بوون؛ گردوکۆ بوونەوەی بەشێک لە بەهەرە و داهات بەهۆی دەست پێ گرتنیانەوە.

**پس انداز کردن**: هەلخستن؛ خستنە لاوە؛ پەزمەندەکردن؛ نۆتەکردن؛ پاشەکەوت کردن؛ نیاتەکردن؛ پاشەکەوت وسەی؛ پاشەکەوت کەردەی.

**پسان‌فردا** [1] / pasānfardā/: *اسم*. سێ‌سۆ؛ سێ‌سوو؛ پەرەونێ؛ پەرەوەرێ؛ پەروانی؛ پاشان سێ‌ڕۆژ؛ سێ ڕۆژی کە: **پسین‌فردا**

**پسان‌فردا** [2]: *قید*. سێ‌سۆ؛ سێ‌سوو؛ لەسێ‌سۆدا؛ پەروەنێوە: **پسین‌فردا**

**پس پریروز** [1] / pasparîrûz/: *اسم*. پەسرپێرەکە؛ پەرەونێ؛ پەراوەرێکە؛ سێ‌ڕۆژ لەمەوبەر.

**پس پریروز** [2]: *قید*. پەسرپێرەکە؛ لە پەسەپێرەکەدا؛ لە پترپێریدا؛ لە پەسرپێرەیدا.

**پس پریشب** [1] / pasparîšab/: *اسم*. پەسرپێرەشەو؛ پەسەپێرەشەو؛ پەراوەرێ‌شەوێ؛ سێ‌شەو لەمەوپێش.

**پس پریشب** [2]: *قید*. لە پەسرپێرەشەودا؛ لە پەسەپێرەشەوێدا.

**پس پسکی** / paspasakî/: *قید*. پسکان-پسکان؛ پسە- پسە؛ پەشتەروانەی: ١. دواوەدوا؛ لەدواوە؛ لەپاشەوە؛ لەپشتەوە ‹پس‌پسکی او می‌رفت: لە دوایەوە دەڕۆیشت› ٢. بەرەودوا؛ وەرەو دما؛ پشتاوپشت؛ بەرەوپاش؛ ڕووەو دما ‹بە جای آنکە بە جلو برود، پس‌پسکی می‌رفت: لەباتی ئەوە بەرەو پێش بڕوا، بەرەو پاش دەڕۆیشت›.

**پس پیرارسال** [1] / paspîrārsāl/: *اسم*. پەسەپێرار؛ پەسەپێرارەکە؛ پەسرپێرارەکە؛ پەرەوێرار؛ سێ ساڵ لەمەوبەر.

**پس پیرارسال** [2]: *قید*. پەسر پێرارەکە؛ لە پەسەپێرارەکەدا؛ لە پەسەپێرارا؛ پەرەوێرارەنە؛ جە پەرەوێرارەوە؛ سێ‌ساڵ لەمەوبەر.

**پست** / past/: *صفت*. ١. *[نامتداول]* کۆتا؛ نەوی؛ نزم؛ نفز؛ نمز؛ نوی؛ نقی؛ نەڤی؛ نەوەر؛ نەمە؛ ڤیل؛ وهار؛ پەست؛ بالا و بلندایی کەم ‹قامت پست: بالای کورت› ٢. گەن؛ خوار؛ وار ‹در آنجا یک جور انگور عمل می‌آید کە پست‌تر از انگور عسگری خودمان است: لەوێدا جۆرێک ترێ دێتە بەرهەم کە لە ترێ عەسکەریەکەی خۆمان خوارترە› ٣. *[مجازی]* تەرەس؛ خوێڕی؛ دوونی؛ بێ‌ئاکار؛ پەست؛ لیم؛ نامەرد؛ بێ‌فەڕ؛ هۆڤەبەر؛ چەوتوچەوێل؛ چەپوچێڕ؛ چەفت؛ نانەجیب؛ بێ‌ئابروو ‹آدمِ پست: مرۆی تەرەس›.

▣ پست شدن: *[کنایی]* سووک بوون؛ چرووک بوون؛ پەس بوون؛ پەست بوون.
هەروەها: **پست شُمُردن**

**پست** / post/: [فرانسوی از ایتالیایی] *اسم*. پۆس؛ پۆست: ١. پۆستە؛ پۆسە؛ کاری ناردنی نامە و بەستە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ‹پست کردن: پۆست کردن› ٢. پۆستەخانە؛ مەزرینگەیەک ئەم کارەی وە ئەستۆوە ‹ادارەی پست سنندج: پۆستەخانەی سنە› ٣. /ها/ ئەو نامە و بەستەیانە وا دەڕواتە پۆستەخانەوە و لەوێوە دەگاتە شوێنی پێویست ‹امروز پست نداشتیم: ئەوڕۆ

پۆسمان نەبوو› ٤. نیگابان؛ قەرەوڵ ‹پست محل: نیگابانی گەڕەک› ٥. /ـها/ بنکه ‹پست دیدەبانی: بنکەی چاوەدێری› ٦. /ـها/ شوێنی نیگابانی ‹آن خیابان در پست من نبود: ئەو شەقامە لە پۆستی مندا نەبوو› ٧. /ـها/ پلەوپایه؛ جێگه؛ جێگا؛ زێ؛ یاگێ؛ پۆست ‹همەی پستهای مهم را داده بود به قوم و خویشهایش: هەموو پۆستە بەرزەکانی دابووە خزم و کەسەکانی خۆی›.

▣ پست اداری: پۆستی مەزرینگەیی؛ پلە و پایەی مەزرینگەیی ‹او پست اداری مهمی داشت: ئەو پۆستێکی مەزرینگەیی بەرزی هەبوو›.

پست اکسپرس: ئێکسپرێس؛ جۆرێک پۆستەی خێرا.

پست الکترونیکی: ئیمەیل؛ جۆرێک پۆستەی کەمپیوتەری: **ایمیل**

پست امدادی: بنکەی فریاڕەسی؛ شوێنێکی تایبەت بۆ پێڕاگەییشتنی لێقەوماوان.

پست برق: پۆستەی کارەبایی؛ شوێنێ کە تێیدا هێزی کارەبایی بەش‌بەش دەکرێت. هەروەها: **پست فشارقوی**

پست خارجی: پۆستەی دەرەکی. هەروەها: **پست داخلی؛ پست شهری**

پست دیدەبانی: بنکەی دیدەوانی.

پست زمینی: پۆستەی زەوینی. هەروەها: **پست هوائی**

پست سفارشی: پۆستەی ڕاسپێراو.

پست فرماندهی: بنکەی سەرۆکایەتی.

اداری پست: مەزرینگەی پۆست؛ بنکەیەک کە کار و باری بەڕێوەبەری پۆستە جێبەجێ دەکات.

باجەی پست ☜ **باجه**

صندوق پست ☜ **صندوق**

▣ **پست دادن**: نیگابانی دان؛ چاوەدێری کردن.

**پست کردن**: خستنە پۆست؛ هەناردن بە پۆست.

**به پست کسی خوردن**: تووش‌بە تووش کەسێکەوە بوون؛ گەییشتن بە کەسێک؛ تووشیاری کەسێک بوون؛ هەڵتەقین؛ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ کەسێکدا ‹رفته بودم بازار، خوردم به پست آزاد: چووبوومە بازاڕ، تووشم بە تووشی ئازادەوە بوو›.

**به پست کسی نخوردن**: *[گفتاری]* بە کەسێک نەشیان؛ باو دڵی کەسێک نەبوون؛ باو شان کەسێ نەبوون؛ پێ‌خۆش نەبوون؛ پێ باش نەبوون؛ بە یۆی نەواردەی؛ وەک یەک نەهاتنەوە ‹نه بابا او به پست ما نمی‌خورد، ولش کن: نە کاکە ئەو بە ئیمەمانان ناشێ، لێی گەڕێ›.

**پستا** / pastā/: *اسم. [گفتاری، نامتداول]* گەڕ؛ نۆرە؛ نۆبە؛ نۆگە؛ سەرە؛ چەل ‹آسیاب است و پستا: ئاسیاو بە نۆرە›.

**پستائی** / pastā'î/ ☜ **پستایی**

**پستاب** / pastāb/: *اسم.* زەردەپەڕ؛ ڕۆژپەڕ؛ ئەنگۆرە؛ زەردەی پەلەکۆ؛ ڕووناکی ئاسمانی پاش ئێواران (بەتایبەت لە کۆساراندا).

**پستان** / pestān/ ـها/: *اسم.* ئەندامێکی گیانلەبەرانی گواندارە کە لە مێوینەدا کاری بەرهەم‌هێنانی شیرە: *الف)* (بۆ مرۆ) مەمک؛ مەمگ؛ مەمکە؛ مەم؛ مەمە؛ مەمڵ؛ مەمڵە؛ چێ‌چێ؛ چیچە؛ چچک *ب)* (بۆ حەیوان) گوان؛ گوانێ؛ گوهانی.

▣ **پستان به تنور چسباندن**: *[تعریض]* دڵ پێوە سووتاندن؛ دڵ بۆ سوواندن ‹اختر خانم خیلی برای آرام پستان به تنور می‌چسباند: خاتوو ئەختەر زۆر بۆ ئارام دڵ ئەسووتێنی›.

**پستان مادر را گاز گرفتن**: *[کنایی]* نان

خواردن و سفره درین؛ پێ‌نه‌زانی‌کردن؛ بێ‌ئه‌مه‌گی‌کردن؛ گۆزه‌ڵێ ماره‌ی ‹او از آنها است که پستان مادرش را هم گاز می‌گیرد: له‌وانه‌یه که نان ده‌خوا و سفره ده‌دری›.

**پستان‌بند** / pestānband، ـها/:/اسم. مه‌مکه‌به‌ند؛ مه‌مک‌به‌ند؛ شاماکی؛ به‌ردلک.

**پستاندار** / pestāndār، ـها؛ ـان/:/اسم. گواندار؛ گوهاندار؛ به‌گوان؛ گیانداری که شیر ئه‌دا به بێچووه‌که‌ی.

**پستانداران** / pestāndārān/:/اسم. گوانداران؛ ده‌سته‌یه‌ک له گیانله‌به‌رانی خوێن‌گه‌رم که زۆرتر له‌شیان به موو یان تووک داپۆشراوه و بێچوو دێنن و شیری پێ ده‌ده‌ن.

▣ **پستانداران آبزی**: گواندارانی ئاوی.

**پستانداران اولیه**: گواندارنی سه‌ره‌تایی.

**پستانک** / pestānak، ـها/:/اسم. ١. مۆستک؛ مه‌گینه؛ مه‌مکه‌مژ؛ مه‌مکه‌مژه؛ مه‌میانه؛ مه‌مله؛ مه‌مله‌مژه ٢. پزدانک؛ پسدانک؛ پستانه‌ک؛ پستانه‌کی تفه‌نگ ٣. مێله؛ مێله‌پستان؛ مێله و پستان؛ ئامرازی پاشینی تراو (وه‌ک گولاو، سه‌م و...).

**پستایی** / pastāyî، ـها/:/اسم. ڕووه؛ بانه؛ بانه‌کلاش؛ بانه‌که‌وش؛ سه‌ره؛ بانه‌ی بریامان و ئاماده‌ی که‌وش که ده‌بێ داکوترێته سه‌ر ژێره‌یدا: **پستائی**

**پستچی** / postčî، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ ترکی] /اسم. پۆسته‌چی؛ نامه‌به‌ر؛ نامه‌ڕه‌سێن؛ نامه‌ڕه‌سان؛ چه‌په‌ر؛ ته‌ته‌ر؛ مرۆی نامه‌به‌ر.

**پستخانه** / postxāne، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. پۆسته‌خانه؛ پۆس؛ پۆسه‌خانه؛ پۆستخانه؛ ده‌زگای نامه‌گرتن و نامه بردن.

**پستر** / poster، ـها/: [انگلیسی]/اسم. پوسته‌ر؛ به‌رگی (زۆرتر گه‌وره و ڕه‌نگی) بۆ داچه‌سپاندن به دیواردا ‹همه‌جا پسترهای انتخاباتی بود: ده‌روبان هه‌موو پۆسته‌ری هه‌ڵبژاردن بوو›.

**پست‌فطرت** / pastfetrat، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. سووک؛ بێ‌شه‌رم؛ نزه؛ نز؛ بێ‌ئابروو؛ بێ‌فه‌ڕ؛ به‌دفه‌ڕ؛ په‌سپنده؛ ئاکارخراپ؛ ناپه‌سه‌ند؛ په‌ست؛ زۆرخوێڕی؛ نابار؛ ناله‌بار.

**پستک** / pastak، ـها/:/اسم. په‌سه‌ک؛ په‌سته‌ک؛ په‌سته؛ چۆخه‌ک؛ سوخمه‌ی بێ‌قۆڵی لباد.

**پست‌مدرن** / postmodern/: [فرانسوی] ☜ **پسامُدِرن**

**پست مدرنیست** / postmodernîst/: [فرانسوی] ☜ **پسامُدِرنیست**

**پست‌مدرنیستی** / postmodernîstî/: [فرانسوی] ☜ **پسامُدِرنیستی**

**پست مدرنیسم** / postmodernîsm/: [فرانسوی] ☜ **پسامُدِرنیسم**

**پستو** / pastû، ـها/:/اسم. خه‌ڵوه‌تی؛ پاشخان؛ پاسخان؛ هێشخان؛ هه‌وێشخان؛ وچخانه؛ گه‌زنه؛ په‌ستوو؛ گه‌نجه؛ هۆده‌یه‌کی چکۆله له پشته‌وه‌ی وه‌تاغ یان دوکانه‌وه ‹اینها را توی پستو قایم کرده بود: ئه‌مانه‌ی له په‌ستووه‌که داشاردبووه‌وه›.

**پست و بلند** / past-o-boland، ـها/: صفت. مه‌رخ؛ به‌رز و نه‌وی؛ چاڵ و به‌رز؛ به‌رز و نزم؛ په‌ست و بڵیند؛ پرهه‌وراز و نشێو ‹زمین پست و بلند: زه‌وی به‌رز و نه‌وی›.

**پسته** / peste، ـها/:/اسم. پسته؛ پسه؛ فستق؛ بسته: ١. داری پسته ٢. مێوه‌ی داری پسته.

▣ پسته‌ی زمینی ☜ **بادام‌زمینی**

پسته‌ی شامی ☜ **بادام‌زمینی**

پسته‌ی کوهی ☜ **بنه ـ٢**

**پسته‌ای** / peste'î/ ☜ **مغزپسته‌ای**

**پستی** / pastî، ـها/: اسم. نەویایەتی؛ نزمایی؛ گناسی؛ نزمی؛ پەستی: ۱. بنار؛ نزمان؛ چالایی؛ پێچەوانەی بەرزایی. بەرانبەر: **بلندی** ‹در پستی دامنەی کوه جنگلی انبوه روییده بود: لە پەستی داوێنی چیاکەوە دارستانێکی چڕ ڕسکابوو› ۲. *[مجازی]* ناکەسی؛ خوێریگەری؛ خوێڕیەتی؛ چەپەڵی؛ بەدفەڕی و بێئاکاری ‹او در دادگاه پستی کرد و برای نجات خودش ...: ئەو لە دادگەدا پەستی کرد و بۆ دەربازکردنی خۆی...›.

**پستی** / postî/: [فرانسوی] *صفت.* پۆستی؛ سەربەپۆست؛ هی پۆست ‹صندوق پستی: سندۆقی پۆستی›.

**پستیژ** / postîj، ـها/: [از فرانسوی/ از ایتالیایی] *اسم.* کلاوقژ؛ قژیدەسکرد: **پستیش؛ پۆستیش**

**پستیش** / postîš/: [از فرانسوی از ایتالیایی] ☜ **پُستیژ**

**پستی و بلندی** / pastîy-o-bolandî، ـها/: *اسم.* بەرز و نزمی؛ بەرزی و نزمی؛ لکچک؛ چاڵبلۆق؛ چاڵیبەرزی؛ چام‌ـچام؛ کەند و کولۆ: ۱. سیلی؛ گەوەیی؛ بەرزایی و نەویایەتی؛ هەوراز و نشێوی ‹جاده خیلی پستی و بلندی داشت: ڕێگەکە زۆر بەرز و نزمی هەبوو› ۲. *[مجازی]* سەختی و سانایی؛ هاسانی و دژواری ‹پستی و بلندی روزگار: بەرز و نزمی ڕۆژگار›.

**پس‌دوزی** / pasdûzî، ـها/: *اسم.* ناودروون؛ جۆرێک دروومان کە لێواری قوماش هەڵدەدەنەوە تا مەکارەکە لە تۆی تان و پۆی پارچەکەوە دەرچێ و شوێنی دروومان لە ڕووەوە دیار نەبێ.

**پسر** / pesar، ـها؛ ـان/: *اسم.* کوڕ: ۱. خورت؛ پس؛ وەن؛ مندالی نێرینەی مرۆڤ ‹پسر همسایه آمده بود: کوڕی دراوسێکەمان هاتبوو› ۲. ڕەبەن؛ پیاوێ کە هێشتا ژنی نەهێناوە ‹چهل سال است هنوز پسر ماندەای؟: چل ساڵە هەر ڕەبەن ماوی؟›.

▣ پسر برادر ☜ **پسربرادر**

پسر خواهر ☜ **پسرخواهر**

**پسراندر** / pesar'andar، ـها/: *اسم.* هەنەزاگ؛ زڕکوڕ؛ کوڕی ژن بۆ زڕبابی یان کوڕی پیاو بۆ باوەژنی.

**پسرانه** / pesarāne، ـها/: *صفت.* کوڕانە: ۱. /ـها/ ئەوەی هی کوڕان بێ یان پێوەندی بەوانەوە هەبێ ‹شلوار پسرانه: پانتۆڵی کوڕانە› ۲. وەک کوڕان ‹موی پسرانه: قژی کوڕانە›.

**پسربازی** / pesarbāzî/: *اسم.* کوڕبازی؛ کوڕوازی؛ ئەو کارانە کە بڕێ کچ بۆ پێوەندیگرتن لەگەڵ کوڕان ئەنجامی ئەدەن.

**پسربچه** / pesarbačče، ـها؛ ـگان/: *اسم.* کوڕیژە؛ کوڕیژگە؛ کەدە؛ لەیرۆ؛ کوڕیلە؛ لاویچە؛ کوڕلە؛ کوڕ لە تەمەنی ۲ تا ۱۲ ساڵدا.

**پسربرادر** / pesar(e)barādar، ـها/: *اسم.* برازا؛ برازاگ؛ کوڕبرا؛ کوڕیبرا ‹پسر برادرش آمده بود اینجا: برازاکەی هاتبووە ئێرە›.

**پسرحاجی** / pesarhācî، ـها/: [فارسی از عربی] *اسم.* *[مجازی]* کوڕەخان؛ کوڕەشێخ؛ بەچکەدەولەمەن؛ مندالی نێرینەی بوودە ‹درس را ول کرد و زن یک پسرحاجی شد: خوێندنی وێڵ کرد و بوو بە ژنی کوڕەخانێک›.

**پسرخاله** / pesarxāle، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* پوورزا؛ میمزا؛ میمکەزا؛ مەتیەزا؛ کوڕی خوشکی دایک ‹مگر پسرخالەی من است؟ بە من چە!: مەگەر پوورزای منە؟ بە من چی!›.

**پسرخواندگی** / pesarxāndegî/: *اسم.* زڕکوڕی؛ دۆخ یان چۆنیەتی زڕکوڕ بوون.

**پسرخوانده** / pesarxānde، ـها؛ ـگان/: *اسم.*

کورحەلی؛ زڕکوڕ؛ حەفەزا؛ کوڕێ کە کەسێ کردوویە بە منداڵی خۆی ‹آرام پسرخواندەی من است: ئارام زڕکوڕمە›.

**پسرخواهر** / pesarxāhar، ـها/:اسم. خوشکەزا؛ خۆیشکەزا؛ خوەیشکەزا؛ خوارزا؛ خوارزی؛ وارەزا؛ وارێزا؛ واڵەزا؛ کوڕی خوشک.

**پسردایی** / pesardāyî، ـها/:اسم. خاڵۆزا؛ لالۆزا؛ کوڕی خاڵۆ.

**پسرزا** / pesarzā/: صفت. کوڕزێ؛ کوڕەوینە؛ خاوەن تایبەتمەندی کوڕ هێنانە دنیا ‹زنان خانوادەی ما همە پسرزا هستند: ژنانی خێڵی ئێمە هەموو کوڕزین›.

**پسرزاده** / pesarzāde، ـها؛ ـگان/:اسم. کوڕەزا؛ منالی کوڕی کەسێک ‹آزاد پسرزادەی ایشان است: ئازاد کوڕەزای ئەوانە›.

**پسرعمو** / pesar'amû، ـها/: [فارسی/ عربی] /اسم. ئامۆزا؛ مامۆزا؛ کوڕمام؛ کوڕی‌مامۆ؛ ئامۆزای نێر.

**پسرعمه** / pesar'amme، ـها/: [فارسی/ عربی] /اسم. پوورزا؛ میمکەزا؛ مەتیەزا؛ میمزا؛ کوڕمەتک؛ کوڕی‌مەتک؛ کوڕی خوشکی باوک.

**پسرمدرسه** / pesarmadrese, -madrase، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. قوتابی؛ قوتاوی؛ کوڕێ کە دەچێتە قوتابخانەوە ‹یکی از این پسرمدرسەها افتاده بود دنبالم: یەکێ لەم قوتابیانە کەوتبووە شوێنم›: **پسرمدرسەای**

**پسرمدرسەای** / pesarmadrese'î, -madrase'î/: [فارسی/ عربی] ☜ **پسرمدرسه**

**پسرو** / pasrow/: صفت. دوارۆ؛ دواوەدوا ڕەو؛ پاشڕۆ؛ دمالوە؛ دماوەلوا؛ دواوەکێش؛ بە تایبەتمەندی بەرەو دوا ڕۆیشتن.

**پسروی** / pasravî، ـها/:اسم. دوارەوی؛ پاشڕۆیی؛ پاشەڕەوی؛ دواوەکێشی؛ دماوەلوەیی؛ بەرەو دوا ڕۆیی. بەرانبەر: **پیشروی**

**پسری** / pesarî/: صفت. کوڕی؛ سەبارەت بە کوڕەوە ‹نوەی پسری: نەوەی کوڕی›.

**پس‌سر** / pasesar/ ☜ **پس**[1]

**پس‌سری** / pasesarî/ ☜ **پس**[1]

**پس‌فردا**[1] / pasfardā/:اسم. دووسبەی؛ دووسۆ؛ دووسوو؛ سبەتر؛ مەستەپیرۆ؛ پیرەی؛ پیرای؛ مەستەبیرۆ؛ مەستەبێرۆ؛ مەشتەبێرۆ؛ دوو بەیانی؛ ژدێلا؛ دووسبحەی ‹پس‌فردا دوشنبه است: دووسبەی دووشەممەیە›.

**پس‌فردا**[2]: قید. دووبەیانی؛ پیرەی؛ لە دووسۆدا؛ لە ژدێلادا ‹پس‌فردا می‌روم: دووبەیانی دەڕۆم›.

**پس‌فرداشب** / pasfardāšab/:اسم. دووسۆشەو؛ دووسبەی‌شەو؛ دوشەوسۆ؛ پیرەی‌شەوێ؛ دوو شەو دوای ئەمشەو ‹پس‌فرداشب، دوشنبه شب است: دووسۆشەو، شەوی سێشەممەیە›.

**پس‌فرداشب**[2]: قید. دووسۆشەو؛ لەدووسۆشەودا؛ لە پیرەشەوێ ‹پس‌فرداشب برمی‌گردد: دووسۆشەو دەگەڕێتەوە›.

**پسکرایه** / paskerāye، ـها/: [فارسی/ عربی] /اسم. پاشکرێ؛ ئەو کرێیە کە دوای گەییشتنی (بار یان موسافیر) دەدرێ. بەرانبەر: **پیشکرایه**

**پسکوچه** / paskûče، ـها/:اسم. لاکۆلان: ١. کووچەی بەر تەسک و پەڕ؛ کۆلانێ کە لە کۆلانی گەورەتر جوێ دەبێتەوە ٢. ڕاڕەوک؛ کۆلانی دوور و تەریک.

**پس‌گردنی** / pas(e)gardanî، ـها/:اسم. پشتەملە؛ پشتەملێ؛ پاتەکێ؛ ئیش؛ ئیشت؛ عیشت؛ شەپەزلەی پشت مل؛ زللە لە پاش مل ‹باید پس‌گردنی می‌خورد: دەبوو پشتەملێ

بخواردایه›.

پس‌لرزه / paslarze، ـها/:اسم. دوالەرزە؛ دوالەرە؛ وردە لەرەی دوای بوومەلەرزە.

پسله / pasale، ـها/:اسم. [گفتاری] قوژبن؛ کونج؛ کەلێن؛ پەنا و پەسیو؛ شوێنی دوور لە چاوی خەلک ‹همه پستوها و پسله‌ها را خوب گشتند ولی چیزی پیدا نکردند: هەموو کون و قوژبنێکیان پشکنی بەلام هیچیان نەدۆزیەوە›.

پسله‌خور / pasalexor، ـها؛ ـان/: صفت. [گفتاری] پسکەخۆر؛ دزەخۆر؛ هوکارە بە خواردنی شتانێک بە پەنامەکی و بە دوور لە چاوی دیتران ‹نگذار بچه‌ات پسله‌خور بشود: مەهێلە مندالەکەت پسکەخۆری لێ دەرچێ›.

پسمانده / pasmānde، ـها/:اسم. پاشماوە؛ پاشمەنە؛ پاشخوانە؛ بەرماو؛ پاتە؛ ئەوەمەنە؛ ئەو پێخۆرەی لە بەردەم کەسانێ‌ترەوە مابێتەوە.

پسند / pasand/:اسم. پەسند؛ پەسەن: ١. بەدڵ؛ کار یان ڕەوتی هەڵبژاردن و پەسند کردن ‹مادر و خواهرم او را پسند کرده بودند: دایک و خۆشکم ئەویان پەسند کردبوو› ٢. بەردڵ؛ بەدڵ؛ وەدڵ؛ لەبەردڵ ‹این کفش پسند من نیست: ئەم کەوشەم بەدڵ نیە›.

ـ پسند ٢: پیواژه. ـ پەسەن؛ ـ پەسند: ١. ـخواز؛ ـچەسپ؛ ـگیر؛ ـگر؛ پەسندکراو؛ پەسینیا ‹دلپسند: دڵ‌بەسەند› ٢. ـ پەسێن؛ ـ پەسین؛ پەسەندکەر ‹مشکل‌پسند: دژپەسەن›.

ـ پسندی / pasandî/: پیواژه. ـ پەسەنی؛ ـ پەسندی؛ ـ پەسێنی؛ کار و ڕەوتی پەسندکردن ‹خودپسندی: خۆپەسینی›.

پسندیدن / pasandîdan/: مصدر. متعدی. //پسندیدی: پەسندت کرد؛ می‌پسندی: پەسند دەکەی؛ بپسند: پەسند بکە// پەسندکردن؛ پەسەن کردن؛ پەسینەی؛ پەسینای؛ بەردڵ کەوتن؛ دڵ گرتن؛ بەدڵەوە چەسپین/ نیشتن؛ بەدڵ بوون؛ شیاو زانینی شتێ یان کەسێک. هەروەها: **پسندیدنی**

■ صفت مفعولی: **پسندیده** (پەسندکراو)/ مصدر منفی: **نَپسندیدن** (پەسند نەکردن)

پسندیده / pasandîde/: صفت. لەبار؛ گونجاو؛ خاس؛ باش؛ چاک؛ ڕند؛ خوو؛ بەردڵ؛ حەژ؛ حەز؛ چێ؛ شیاو؛ پەسند؛ پەسندکراو؛ پەسێنراو ‹این رفتار، پسندیده‌ی شما نیست: ئەم ئاکارە بۆ ئێوە لەبار نیە›.

پس‌نگری / pasnegarî، ـها/:اسم. پێداڕوانی؛ پاشەنواڕی؛ کار یان ڕەوتی پێدا چوونەوە؛ پیا چوونەوە؛ ڤەڕوانین؛ پێدا گەڕانەوە؛ پێدا ڕوانینەوە و پێدا چوونەوەی ڕووداوەکانی ڕابردوو.

پس و پیش / pas-o-pîš/: صفت. بەر و دوا؛ پاش و پێش؛ وەر و دما ‹این چند جمله پس و پیش است: ئەم چەند ڕستەیە بەر و دوایە›. هەروەها: **پس و پیش شدن**

پسوند / pasvand، ـها/:اسم. [دستور] پاشگر؛ واژۆکە؛ لەتە وشەیەک کە بە دوای وشەدا دادەمەزرێ و مانا و چییەتیەکەی دەگۆڕێ ‹«گر» در واژه‌ی آهنگر پسوند است: «گەر» لە وشەی ئاسنگەردا پاشگرە›.

پسیکولژی / pesîkolojî/: [فرانسوی] اسم. ڕەوان‌ناسی؛ دەروون‌ناسی.

پسین / pasîn/: صفت. [ادبی] دوایین؛ دوایی؛ پاشین؛ دومایی؛ دمایی؛ ئاخری؛ دوماهی؛ پاشن ‹روزهای پسین: ڕۆژانی دوایین›.

پسین‌پریروز / pasînparîrûz/ ☜ **پسان‌پریروز**

پسین‌فردا / pasînfardā/ ☜ **پسان‌فردا**

پش / paš/ ☜ **پَژ**

پشام / pašām/: [؟] اسم. [پزشکی] پەنام؛ هەڵماسینی لەش بە یەکجاری بە بۆنەی

کۆبوونەوەی تراو لە ژێر پێستەوە.

پشت ¹ / pošt ، ـها/:/اسم. مێنە؛ پشت؛ پێشت؛ پەشتی؛ پوق؛ ڕەت: ١. ئەو دیو؛ ئەو ڕووی؛ ئەو بەشەی لە شت کە پێچەوانەی بەرە ‹پشت پارچە: پشتی پارچە› ٢. مازی؛ بەشێ لە لەشی گیانداران کە دەکاتە ئەودیوی سنگ و سکیان ‹پشتم درد می‌کند: پشتم دەیشێ› ٣. پشتەوە؛ ئەو ڕووی؛ ئەو دیوی هەر شتێ ‹پشت کوه: پشتی کێو›.

◘ پشت بام: سەربان؛ بان‌ماڵ؛ پشت‌بان؛ زەرۆڵە؛ سەربوو؛ پەشتۆبانی؛ هاف؛ بان‌خانی.

پشت پا: پشت‌پا؛ پەشتەپا؛ پشتەپا: ١. پشتی‌پا؛ چاڵی لای قاپوورە ٢. لێدان بە پاژنەی پا.

پشت پرده ☜ پس پرده، **پَس**¹

پشت جبهه: پشتی شەڕگە؛ شوێنی هێندێک دوورتر لە شەڕگەوە.

پشت جلد: پشت‌بەرگ؛ پشتی بەرگ؛ پەشتەوەڵگ؛ نیوەی بەرگ کە بە کتێبەوە لکاوە (لە کتێبی فارسی و کوردی وعەرەبیدا لە لای چەپ و لە کتێبی لاتیندا لە لای ڕاستەوەیە).

پشت دست: پشت‌دەست؛ پشتی دەست؛ پڕدەست؛ بان دەست؛ پەشتۆدەسی؛ مازی‌دەسی؛ ئەو دیوی ناودەس.

پشت سر: [گفتاری] پشتی‌سەر؛ پشتەسەر؛ پەشتەسەر؛ پش‌سەر؛ پشت‌سەر؛ پەش‌سەر؛ پەشتۆسەرەی: ١. دوا؛ دوما؛ دما ٢. [مجازی] پشتەملە؛ پاشەملە ‹پشت سر تو خیلی بد می‌گفت: پشتەسەرت زۆر خراپەی دەگوت›.

پشت صحنه: پشتی شانۆ؛ شوێنی خۆ تەیارکردن و وچاندانی شانۆگەر.

پشت گردن: بۆق‌مل؛ پشت‌مل؛ پشتەمل؛ پەشتەمل؛ بان‌مل؛ پەشتۆملی؛ پشتی‌گەردن.

پشت گوش: پشت‌گوێ؛ پشت گوێچکە؛ پەشتۆگۆشی.

پشت گوش فراخ: [کنایی] پشت‌گوێ‌خەر؛ سنگەسنگ‌کەر؛ کارمردارەوکەر؛ ناکار و کەمتەرخەم.

◘ پشت به هم دادن: [کنایی] پشتی یەک گرتن؛ پاڵ بە یەکەوە دان؛ پاڵ دان بەیەکەوە؛ پاڵ دایوە هەنترینیەوە؛ پشت بەیەکەوە دان ‹پشت به هم دادیم و کارگاه را راه انداختیم: پشتی یەکمان گرت و کارگەکەمان خستەڕێ›.

پشت پا زدن: ١. پاچەقولەدان؛ پاچەقولێ‌دان؛ پا وەبەر پادان؛ پا دانە بەر پا؛ بە پشتی پا لێدانی کەسێک بە مەبەستی ڕماندنی ‹یک پشت‌پا زد و او را به زمین انداخت: پاچەقولەیەکی دا و ڕماندی› ٢. [کنایی] چش لێ‌کردن؛ بەتوون لێ‌کردن؛ وێڵ‌کردن؛ چاو لێ‌داخستن؛ دانەژێر؛ دەست لێ‌بەردان؛ پێ لێنان؛ پا پیانان؛ پشت لێ هەڵکردن؛ دەس چنە ئاسەی ‹یک روز به همه چیز پشت‌پا زد و از ایران رفت: ڕۆژێک چەشی لە هەموو شتێک کرد و لە ئێران چوو›.

پشت چشم نازک کردن: [مجازی] خۆ شیرین‌کردن؛ ئینجە و فینجەکردن؛ فیز و نازکردن ‹مادر عروس برایمان پشت چشم نازک می‌کرد: دایکی بووک زۆر ئینجە و فینجەی نەکرد بۆمان›.

پشت خم کردن: [کنایی] ١. چەمانەوە؛ کۆمیانەوە؛ داموکانەوە؛ چەمیایوە؛ پیر بوون ‹با این همه سن و سال، پشت خم نکرده است: بەم هەموو عومرەوە، نەچەمیوەتەوە› ٢. [کنایی] کڕنۆش بردن؛ چەمانەوە؛

چەمیایوە؛ دانەوینەوە بە نیشانەی ڕێزگرتن ‹آدم شرافتمند جلو اینها پشت خم نمی‌کند: مرۆی بەشەرەف لە بەرامبەر ئەمانەوە کڕنووش نابا› ٣. *[کنایی]* پشت چەمانەوە؛ چەمانەوە؛ ئەوەچەمیەی؛ لە کارکەوتن و بێ‌هێز بوون؛ توانی کارکردن لە دەس‌دان ‹برخی زیر بار مشکلات زندگی پشت خم کرده‌اند: بڕێ لە ژێر باری گیر و گرفت ژیاندا پشتیان چەماوەتەوە›.

پشت دادن: پاڵ‌دانەوە؛ پاڵ‌کەوتن؛ شان داهێشتن؛ شان داهێلان.

پشت دست خود را داغ کردن: *[مجازی]* پشتە دەستی خۆ داخ‌کردن؛ بەڵێن دان لە سەر نەکردنی کارێک ‹پشت دستم را داغ کردم که دیگر با تو جایی نروم: پشتە دەستی خۆم داخ کرد کە ئیدی لەگەڵتا نەچمە هیچ شوێنێک›.

پشت دست را گزیدن/ گاز گرفتن: *[ادبی]* دەس بە دەما بردن؛ قەپ بە وێژنگا کردن؛ کاڵەک بە ئەژنۆ شکاندن؛ هەست بە پەشیمانی‌کردن.

پشت زدن: دادان؛ دانە ئەو دیو؛ دەرکەوتنی ڕەنگ یان مەرەکەف لە پشتی قاقەزەوە ‹صفحه پشت زده بود و خوانده نمی‌شد: پەڕەکە دای دابوو نەدەخوێندرایەوە›.

پشت سر کسی بودن: ١. لە پشت سەر کەسێکەوە بوون؛ لە دوای کەسێکەوە بوون؛ پەشتە سەروو یۆی بیەی؛ لە شوێن کەسێکەوە بوون ‹من پشت سر این آقا هستم: من لە دوای ئەم کابرایەدەم› ٢. *[مجازی]* لە سەر کەسێک بوون؛ لە پشت کەسێک بوون؛ پشتیوانی کەسێک بوون ‹همه پشت سر دولت هستند: هەموو پشتیوانی دەوڵەتن›.

پشت کاری را گرفتن: *[مجازی]* شوێن کارێک‌گرتن؛ کەوتنە دوای کارێکەوە؛ پەی کارێ‌گرتن؛ پەیگیری کارێک کردن؛ بەدوای کارێکدا چوون؛ لە سەر کارێ سوور بوون ‹پشت درست را بگیر، بلکه لیسانست را بگیری: شوێن دەرسەکەت بگرە، بەڵکوو لیسانسەکەت وەرگری›.

پشت کردن: *[کنایی]* پشت لێ‌کردن؛ پشت لێوەکردن؛ پشت لێ‌کردنەوە؛ بەجێ هێشتن ‹او به همه چیز پشت کرده بود: ئەو پشتی کردبوو لە گشت شتێک› ٢. پشت لێ هەڵکردن؛ پشت تێ‌کردن؛ ڕوو وەرگەڕاندن؛ ڕوو هەڵگەڕاندن؛ پشت هەڵکردن ‹چرا پشتت را به من می‌کنی: بۆچی پشتم لێ هەڵدەکەی›.

پشت کسی باد خوردن: *[مجازی]* لە کەسێک سارد بوونەوە؛ هاڵ بوونەوە؛ کەهاڵ بوونەوە ‹این یک ماه تعطیلی پشتم باد خورده: لەم یەک مانگ پشوودانەدا لێ سارد بووەمەتەوە›.

پشت کسی را به خاک مالیدن: *[کنایی]* لە خاک‌گەوزاندن؛ پشتی کەسێک بە زەویدا دان؛ گەوزاندن؛ پشت کەفت‌کردن؛ پشتی کەسێک خەواندن ‹پشت دشمن را به خاک مالیدند: دوژمنیان لە خاک گەوزاند›.

پشت کسی را داشتن: *[مجازی]* پشتی کەسێک گرتن؛ لە پشتی کەسێکەوە بوون؛ پشتیوانی لە کەسێ‌کردن ‹خیالت راحت باشد ما پشت را داریم: دڵنیا بە ئێمە پشت نەگرین›.

پشت کسی را شکستن: *[کنایی]* پشتی کەسێک شکاندن؛ مرۆخە شکاندن؛ برسی کەسێک بڕین؛ مازی یۆی ماڕەی ‹مرگ فرزند پشت او را شکست: مەرگی منداڵ پشتی شکاند›.

**پشت کسی شکستن:** *[کنایی]* برستی کەسێک بڕیان؛ پشتی کەسێک شکیان؛ مازی یۆی مریەی ‹با مرگ پسرش پشت او شکست: بە مەرگی کوڕەکەی پشتی شکا›.

**پشت کسی لرزیدن:** *[کنایی]* ڕۆحی کەسێک تۆقین؛ دڵ لە لای کەسێکەوە نەمان؛ زەندەق چوون؛ زۆر ترسان ‹از شنیدن آن خبر پشت من لرزید: لە بیستنی هەواڵەکە ڕوحم توقی›.

**پشت لب کسی سبز شدن:** خەت دان؛ گەنەموو دان؛ بۆزکردنەوە؛ سمێڵ سەوز بوون ‹تازه پشت لبش سبز شده بود: تازە خەتی دابوو›.

**پشت گوش خاراندن:** *[کنایی]* منجەمنج کردن؛ سەر خوراندن؛ مسەمس کردن ‹درست دقت کن و اینطور پشت گوش نخاران: جوان سەرنج بدە و ئاوا منجەمنج مەکە›.

**پشت گوش خود را دیدن:** *[مجازی]* هێلکە لە سەر چیلکە ڕاگرتن؛ ئەنیشکی خۆ ماچ کردن ‹اگر پشت گوش خود را دیدی او را هم می‌بینی: ئەگەر ئەنیشکی خوتت ماچ کرد ئەویش دەبینیەوە›.

**از پشت خنجر زدن:** *[کنایی]* خەیانەت کردن ‹او از پشت به من خنجر زد: ئەو خەیانەتی پێم کرد›.

**از پشت کوه آمدن:** *[کنایی]* لە گوێی گادا خەوتن؛ لە کوولەکە باخاندا سەیرکردن؛ تەواو بێ‌خەبەر بوون ‹خیال می‌کنی من از پشت کوه آمده‌ام: وا دەزانی من لە گوێی گادا خەوتووم›.

**پشت[2]:** *قید.* پشت؛ لە پشت؛ لە پشتەوە؛ پەشت؛ پەشتۆ: ١. ئەو دیوی شتێک ‹پشت دست کسی زدن: لە پشت دەستی کەسێ دان› ٢. لەو دیو؛ چەو دیم ‹پشت درختها بود: لە پشت دارەکانەوە بوو› ٣. لەوبەر؛ ئەو دەست؛ چەو دەس؛ لەو بەریەوە ‹پشت میز نشسته بود: لە پشت مێزەکەوە دانیشتبوو›.

◘ **پشت پای کسی:** دوابەدوای کەسێکەوە؛ بەشوێن پای کەسێکا ‹پشت پای شما آمد: دوابەدوای ئێوەوە هات›.

**پشت سر کسی:** بە دوای کەسێکدا؛ لە دوای کەسێکەوە؛ بەشوێن کەسێکەوە؛ شۆنۆ یۆیەرە ‹پشت سر تو آزاد آمد: بەدوای تودا ئازاد هات›.

**پشت سرهم:** پەیتا- پەیتا؛ لە دوای یەکدا؛ بە دوای یەکا؛ پەیاپەی؛ پشت سەر یەک؛ لە سەریەک؛ پەستا- پەستا؛ پەسا- پەسا؛ پەساپەس؛ شۆنوو هەنترینیەرە ‹آدمها پشت سر هم می‌آمدند و می‌رفتند: خەڵکی پەیتا-پەیتا دەهاتن و دەڕۆیشتن›.

**پشت صحنه:** *[مجازی]* لە ژێرەوە؛ بە دزیەوە؛ پەنامەکی ‹بعضی از نمایندگان در پشت صحنه برای سقوط دولت می‌کوشیدند: هەندێ لە نوێنەران لە ژێرەوە بۆ ڕووخاندنی دەوڵەت هەوڵیان دەدا›.

**پشت کردن:** بەڕیز؛ بەڕزن؛ بەڕێچکە؛ پێڕ؛ پشتە سەر یەکەوە و لەیەک ڕیزدا.

◘ **پشت سر کسی حرف زدن:** *[کنایی]* لە پشت سەر کەسێکەوە قسەکردن؛ پاشملەی کەسێک گوتن؛ پشتەسەر قسە کردن؛ پشتەملە قسەکردن ‹نمی‌خواهم پشت سرم حرف بزنند: نامەوێ لە پشت سەرمەوە قسە بکەن›.

**پشت سر کسی نماز خواندن:** *[کنایی]* سەر بە کەسێک سپاردن؛ خۆ بە کەسێک سپاردن ‹اهل محله پشت سرش نماز می‌خوانند: خەڵکی گەڕەکەکە سەری پێی دەسپێرن›.

**پشت فرمان نشستن/ بودن:** لە پشت فەرمانەوە بوون؛ شۆفێری کردن.

پشت قباله انداختن: کردنه مارەیی ‹یک خانه و دو هکتار باغ انداخته بود پشت قاله‌ی عروس: مالێک و دوو باخی کردبووه مارەیی بووکەکە›.

پشت‌گوش انداختن: *[مجازی]* پشت‌گوێ خستن؛ وەدوا خستن؛ گوێ پێنەدان؛ بە قنگا خستن ‹هرچه گفتم برو پولت را بگیر، پشت گوش انداخت و نرفت: هەرچی گوتم برۆ پارەکەت وەربگرە خستبە پشت گوێ و نەڕۆیشت›.

ـ پشت ~ : *پیواژه.* ـ چڕ؛ ـ پڕ؛ ـ پەر؛ پۆڕ ‹پُرپشت: زۆر پڕ›.

**پشت‌باز / poštbāz**: *صفت.* ١. پشت‌تاک؛ پشت‌تاق؛ پشت‌واز ‹کفش پشت‌باز: کەوشی پشت‌تاک› ٢. پشت‌ئاوڵە؛ تایبەتمەندی شتێ کە لە پشتەوە باز بێت ‹پیراهن پشت‌باز: کراسی پشت ئاوڵە›.

**پشت‌بسته / poštbaste**: *صفت.* پشت بەستراو.

**پشت‌بغل / poštbaqal**، ـها/: *اسم.* *[معماری]* سێسووچ؛ سێ کونجی پەنای تاق.

**پشت‌بند / poštband**، ـها/: *اسم.* پاڵەوانە: ١. *[معماری]* پاڵ‌بەست؛ پشت‌بەست ٢. پشت‌بەن؛ پشت‌خەر؛ پشت‌بەس؛ پشت‌وەس؛ پشت‌کڵۆم؛ شەوژەن؛ شەوژەنە؛ پەشتوز؛ پشتکۆڵ ٣. پشت‌پاڵ؛ پاڵپشت؛ کارێتە.

**پشت به پشت / poštbepošt**: *قید.* پشت لە پشت؛ پشت بە پشت؛ پشتاپشت ‹صندلیها را پشت به پشت بچین: کورسیەکان پشت لە پشت بچنە›.

**پشت در پشت / poštdarpošt**: *قید.* پشت لە پشت؛ پشتاوپشت؛ پشتاپشت؛ پەشتاوپەشت ‹آنها پشت در پشت باسواد بودند: ئەوان پشتاوپشت خوێنەوار بوون›.

**پشت‌درد / poštdard** ☜ ـ درد[2]

**پشت‌دری / poštdarî**، ـها/: *اسم.* ژێرپەردە؛ پژدەری؛ پش‌دەری؛ تۆڕ یان پارچەیەکی تەنک کە دەکەوێتە نێوان پەنجەرە و پەردەوە ‹پنجرەها پشت‌دری‌های خوشرنگی داشت: پەنجەرەکان ژێرپەردەی خۆش‌ڕەنگیان بوو›.

**پشت‌دستی / poštdastî**، ـها/: *اسم.* پشتەدەست ‹یک پشت دستی بزن تا دیگر این کارها را نکند: پشتەدەستێکی لێدە تا ئیتر لەم کارانە نەکا›.

**پشت‌رو / pošt(e)rû**: *صفت.* پێچەوانە؛ بەرەوپشت؛ واژی؛ بەراوژی؛ بەراوەژوو؛ ئاوەژۆ؛ دێوچەپ؛ قەڵ‌واری؛ هەڵەوگەڕیاگ؛ وەڵەودیم ‹پیراهنش را پشت‌رو پوشیده بود: کراسەکەی پێچەوانە کردبووە بەری›؛ **پشت‌ورو**

**پشتک / poštak**، ـها/: *اسم.* تەقڵە؛ مەقولات؛ سەرموقولات؛ سەرمەقولتان؛ سەرمەقولات؛ سەرەمەوقلانج؛ سەرملەقۆتانی؛ قلوران؛ فلوران؛ دەقلوس؛ سەلاقوچکە؛ قوچگانی؛ بەلاقوچکانی؛ محەللەق؛ جقڵمبە؛ تۆمپز.

بەرانبەر: **وارو**

◘ **پشتک** زدن: تەقڵە لێدان؛ سەرمەقولات دان؛ سەرمەقولانج‌لێدان؛ سەرملەقۆتانی پێکەی.

**پشتکار / pošt(e)kār**: *اسم.* پێداگری؛ پشتگری؛ پشتکار؛ بەردەوامی و شێلگیری لە کاردا ‹اگر می‌خواهی موفق شوی، باید پشتکار داشته باشی: ئەگەر دەتەوێ سەرکەوی، دەبێ پێداگری بکەی›.

**پشتک‌چارکش / poštakčārkoš** ☜ **جفتک‌چارکُش**

**پشت‌گردنی / pošt(e)gardanî**، ـها/: *اسم.* پشتەمل؛ پشتەملە؛ شەپەلاغەی لە پشت مل.

پشتگرم / poštgarm/: صفت. [مجازی] دڵگەرم؛ پشتگەرم ‹او بە حمایت شما پشتگرم است: ئەو بە پشتیوانی ئێوەوە دڵگەرمە›.
پشتگرمی / poštgarmî، ـها/: اسم. [مجازی] دڵگەرمی؛ پشتگەرمی.
پشت‌گلی [1] / poštgolî/: اسم. سوورکاڵ؛ ئەرخەوانی؛ ڕەنگی سووری ئاماڵ سپی ‹پشت‌گلی رنگ دلخواه من است: سوورکاڵ ڕەنگی دڵخوازی منە›.
پشت‌گلی [2]: صفت. سوورکاڵ؛ بە ڕەنگی سووری ئامال سپی ‹دستمال پشت‌گلی: دەسرەی سوورکاڵ›.
پشت‌مازو / poštmāzû/ ☜ پشت‌مازه
پشت‌مازه / poštmāze، ـها/: اسم. پشت‌مازە: ١. دوو لای مۆرخەی پشت ٢. مازە؛ گۆشتێک کە لە دوولای گازەڕای پشتەوەیە* پشت‌مازو
پشت‌میزنشین / poštemîznešîn، ـها/: صفت. [کنایی] یاخەسپی؛ مووچەخۆر ‹شوهرش پشت‌میزنشین است: مێردەکەی یاخەسپیە›.
پشت‌نویسی / poštnevîsî، ـها/: اسم. پشت‌نووسی؛ نووسینی پشتی بەڵگەیەک بۆ سەلماندن یان قەولاندنی.
پشتو / paštû, poštû/: اسم. پەشتوو؛ لە زمانگەلی ئێرانی ڕۆژهەلاتیە کە زۆرتر لە ڕۆژئاوا و باشووری ئەفغانستان و باکووری ڕۆژاوای پاکستاندا پەرەی سەندووە.
پشتواره / poštvāre، ـها/: اسم. تۆشەوەرە؛ تۆیشەبەر؛ هەبان؛ خەلتک؛ خلتک؛ کۆڵ؛ کۆڵەبار؛ هەگبە؛ ئەوندە لە بار کە کەسێک بتوانێ بیبا.
پشتوانه / poštvāne، ـها/: اسم. پشتیوانە؛ پشتوانە ‹پشتوانەی مالی: پشتیوانیی مالی›.
پشت‌وپناه / pošt-o-panāh/: اسم. پشتیوان؛ پشتگر؛ پشت و پەنا؛ پێشتیەوان ‹پس از مرگ پدرم، او یگانه پشت و پناه ما بود: دوای مەرگی بابم، ئەو تاقە پشتیوانمان بوو›.
پشت و رو / pošt-o-rû/ ☜ پُشت‌رو
پشته / pošte، ـها/: اسم. کۆگا؛ تەیلە؛ تێلەکە؛ کۆڵ؛ گر؛ گرک؛ تەپکە؛ قوتکە: ١. کوا؛ تەپۆلکە؛ تلم؛ گردووک؛ قوتکەی (ڕسکی یان دەسکردی) سەرزەوین ‹پشتەی خاک: قوتکەی خاک› ٢. تۆشەوەرە؛ کۆڵەبار؛ هەگبە؛ کۆڵ؛ بار ٣. مەودای نێوان دوو میلەی کارێز.
پشت‌هم‌انداز / poštehamandāz، ـها؛ ـان/: صفت. [گفتاری، مجازی] فێڵباز؛ جەلبەز؛ ساختەچی؛ گزیکار؛ خاپی؛ بەفێڵ؛ فێڵچی.
پشتی [1] / poštî، ـها/: اسم. ١. پشتی؛ پشتیە؛ پالشت؛ پالپشت؛ پالەوپشت؛ بالنج ‹به پشتی تکیه داده بود و قلیان می‌کشید: پالی دابوو بە پشتیەکەوە و قلیانی دەکێشا›.
پشتی [2]: صفت. پشتین؛ پشتی؛ پەشتین؛ پشتەوە ‹حیاط پشتی: حەوشە پشتی›.
پشتی [3] /ـها/: ضمیر. دوایی؛ دوایین؛ دمایی؛ دمەیین ‹مواظب پشتی باش: ئاگات لە دواییەکە بێت›.
پشتیبان / poštîbān، ـها؛ ـان/: اسم. پشتیوان: ١. هەڤپشت؛ ئەرخە؛ یاریدەر؛ کۆمەگ؛ ئاریکاری باش؛ تەکیەگاه؛ هاریکار؛ بامن؛ تەل؛ ئەلات ‹نیروی پشتیبان: هێزی پشتیوان› ٢. پالپشت؛ پشتگر؛ هامیار؛ یاریدەرێ کە بۆ خۆی دەستی لە کاردا نیە ‹عمویم پشتیبان ماست: مامم پشتیوانمانە›.
پشتیبانی / poštîbānî، ـها/: اسم. ١. داکۆکی؛ پشتیوانی؛ لاگیری؛ یاریدەدری؛ هاریکاری؛ پشتگری ٢. [نظامی] هێزی چەکداری تەیارکراو بۆ یاریدەی شەڕکەران.
پشک / pešk, pešg، ـها/: اسم. ١. پشک؛

کالیمستی؛ کالەمستیێ؛ کەلەمشتیێ؛ پشکیلان؛ حەقلیمەقۆ ٢. پشکەڵ؛ پشکەڵی؛ پشقل؛ پشکۆڵ * **پشگ**

▣ پشک انداختن: ١. پشک خستن ٢. پشکەڵ کردن.

**پشکل** / peškel, pešgel، ـها/: اسم. تڵ؛ پشکەڵ؛ پشکەڵی؛ بشکول؛ کشپەڵ؛ کشپل؛ قشپل؛ پشقل؛ گوشپل: **پشگل**

**پشگ** / pešg/ ☜ **پشک**

**پشگل** / pešgel/ ☜ **پشکل**

**پشم** / pašm، ـها/: اسم. ١. خوری؛ هەری؛ هری؛ پەشم؛ پەژم؛ خوریلە؛ کوڵکەی پەز ٢. *[گفتاری]* تووک؛ کوڵک؛ کوڵکە؛ مووی لەشی گیانلەبەر ٣. *[گفتاری]* پووک؛ پووچ؛ پووچەڵ؛ بێناوەرۆک؛ بێ کاکڵە.

▣ پشم آنقره: مەرەز؛ کوڵکەی لەشی جۆرێ بزنی کوردەواری.

پشم بهاره: پەشمی بەهارە؛ خوری بەهارە؛ ئەو خوریە بەهاران لە لەشی پەز دەبڕدرێتەوە. هەروەها: **پشم پاییزه**

پشم خام: خوری؛ بەرگن.

پشم سنگ: ڕیشاڵی دەسکردی وەک شیشە کە بنەمای لە بەردە.

پشم شیشه: پەشمەشیشە؛ ڕیشاڵی شیشە.

پشم مصنوعی: ڕیشاڵی دەسکرد.

▣ پشم به کلاه نداشتن: *[کنایی]* بێدەسەلات بوون؛ هیچ لە دەس نەهاتن.

پشم چیدن: بڕینەوە ‹پشم چیدن گوسفند: بڕینەوەی مەڕ›.

پشم رشتن/ ریسیدن: ڕێسان؛ بادان؛ ڕسین؛ ڕێسەی؛ ڕێستەی؛ خوری ڕستن.

پشم زدن: شیکردنەوە؛ کوڵک و مووش کردن؛ پەژم شیەوەکەردەی.

پشم ریختن: *[کنایی]* بێدەسەلات کەوتن؛ پەل نەمان؛ بێدەست بوون؛ پەل و هەل نەمانی کەسێ.

**پشمالو** / pašmālû، ـها/: *صفت.* تیسکۆ؛ تیسکن؛ وەرگن؛ گوشین؛ جەژمی؛ کوڵکن؛ تووکن؛ توکنە؛ زۆر بە موو؛ زۆر بە تووک؛ بەکوڵکە؛ موینە؛ بەتیسک؛ تیسکن؛ بەموو؛ موودار ‹سینەی پشمالو: سینەی تووکن؛ گربەی پشمالو: پشیلەی تیسکن›.

**پشمباف** / pašmbāf، ـها؛ ـان/: اسم. ١. جۆلا؛ پەشمهۆن؛ پەژمچن؛ پەژمووەن ٢. *[گفتاری]* بەرگنە؛ بەرگن: **پشمبافت**

**پشمبافت** / pašmbāft/ ☜ **پشمباف ـ٢**

**پشمبافی** / pašmbāfî/: اسم. جۆلایی: ١. پەشمهۆنی؛ پەژمچنی ٢. کارخانەیەک کە جۆلایی تێدا دەکەن ٣. کاری جۆلا.

**پشم‌چین** / pašmčîn، ـها/: اسم. ١. برینگەچی؛ پەشمبڕ؛ خوریچن ٢. برینگ؛ برەنگ؛ هەبرەنگ؛ هەورینگ؛ هەورێنگ؛ ئامرازی پەشم چنینەوە.

**پشم‌چینی** / pašmčînî/: اسم. برینەوە: ١. /ـها/ کار و ڕەوتی پەشمچنین ‹فصل پشم‌چینی: وەرزی برینەوە› ٢. کاری برینەوە ‹کارش پشم‌چینی است: کاری برینەوەیە›.

**پشم‌ریس** / pašmrîs، ـها؛ ـان/: اسم. خوریڕێس؛ تەشیڕس؛ تەشیڕێس؛ خوریڕس؛ خوری بادەر؛ پەژمڕێس؛ لەتەرەڕێسە؛ کەسێ کە کاری ڕستنی خوری یان مەرەزە.

**پشم‌ریسی** / pašmrîsî/: اسم. ١. /ـها/ خوریڕێسی؛ پەشمڕسی؛ پەژمڕێسەی ٢. کاری خوریڕێس.

**پشمک** / pašmak/: اسم. پەشمەک؛ جۆرێک شیرینیە وەک خوری سپی کە لە شەکر و ڕۆن دروستی دەکەن.

**پشم‌و‌پیله** / pašm-o-pîle، ـها/: اسم. *[تعریض]* ڕیش و پەشم؛ کوڵک و موو؛ مووی زۆری

بەتایبەت سەر و ریش و لەش: **پشموپیلی**

**پشم و پیلی** / pašm-o-pîlî/ ☜ **پشم و پیله**

**پــشمی** / pašmî، ـهـا/: *صـفت.* پـەشمـی؛ پەژمی؛ لە خوری چێ‌کراو.

**پــشمین** / pašmîn/: *صـفت. [ادبـی]* پـەژمـی؛ پەشمی؛ لە خوری دروست‌کراو.

**پــشمینه** / pašmîne، ـهـا/: *اسـم. [ادبـی]* پەشمین؛ پەشمـی؛ پـەشمینـە؛ پـەژم‌کـار؛ لـە خوری درووسکراو.

**پــشنگ** / pašang، ـها/: *اسم.* پرشە؛ پرشـنگ؛ پریـــشە؛ پریـــشک؛ پرپـــشک؛ پـــژگ؛ پژگـــە؛ بژنگ؛ ماڵۆکەن؛ پریشکەی ئاو یا ئاگر.

**پشه** / pašše, paše، ـها؛ ـگان/: *اسم.* مێـشوولە؛ مێـــشوولکە؛ مــەشـــوولە؛ پێـــشوولە؛ پێـــشکە؛ پێـشی؛ تۆفانـە؛ مـورک؛ مـەرەشـە؛ پـەخـشە؛ پـــەشـــە؛ بـــەهـــسک؛ خاکـــە؛ تـــەپـــوو؛ پەخشەکوورە؛ هورە.

▣ پشەی پرّان ☜ **پشەی خاکی**

**پــــشەی خـــاکی**: ئاخرکـــــە؛ ئـــــاخویرک؛ مێـــشوولەی زۆر ورد: **پـــشەی پـــرّان؛ پـــشه ریزه؛ پشه کوره**

پشه ریزه ☜ **پشەی خاکی**

پشه کوره ☜ **پشەی خاکی**

**پشەی مالاریا**: مێشوولەی مالاریا.

▣ **پــشه پــر نــزدن**: *[کنـایی]* خـشەی گـەلا نەهاتن؛ کڕ و کپ بوون؛ قڕ و قپ بوون.

**پشه را در هوا نعل کـردن**: *[مجـازی]* چـاو مـار دەرهـاوردن؛ لـە بـواردان و تـەڕ نـەبـوون؛ یـەکجار بزێـو بـوون ‹آزاد را مـی‌گـویی؟ پشه را در هـوا نعـل مـی‌کنـد: ئـازاد دەڵـێی؟ چـاوی مـار دەردینی›.

**پـــشه زدن**: مێـــشوولە پێـــوەدان؛ مێـــشوولە خـــواردن؛ مـەشـوولەگـەسـەی؛ مـەشـوولە واردەی ‹دیـشب چنـد جـای صـورتم را پشه زد: دوێشەو لـە چـەنـد لاوە مێشوولە دای بـە دەم و چاومەوە›.

**پـــشه لگـــد زدن**: *[تعـریض]* قۆلانچـە پـا پێـدا نیـان (لـە وەرامـی کەسـێکدا کـە بـۆ ئـازارێکی سـووک، هـەرا و هـاوارێکی زۆری هـەبێ) ‹چـی شـده؟ لابـد بـاز پـشه لگـدت زده! چ بـووە؟ ڕەنگـە هەمیسان قولانجە پای پیتدا نابی!›.

**پـشه‌بنـد** / pašeband، ـها/: *اسم.* پـەشـەبـەن؛ پەشەوەن؛ چاوەیـەکـی تـۆڕی بـۆ پاراسـتن لـە پێوەدانی مێشوولە ‹شبهای تابستان در پشت‌بام زیـر پـشه‌بنـد مـی‌خوابیـدیم: شـەوانی هـاوین لـە سەربان لەنێو پەشەبەن دەنووستین›.

**پـــشه‌خـــوار** / pašexār، ـهـا؛ ـان/: *اسـم.* پەشەخۆر؛ مێشەخـۆرە؛ باڵـندەیـەکـە خـۆراکی مێش و مێشوولەیە.

**پشه‌کـش** / pašekoš، ـها/: *اسم.* مێـشوولەکـوژ؛ دەوایێکە مێشوولە دەکوژێ.

**پـشیز** / pašîz، ـها/: *اسم. [ادبی]* بێـزە؛ پـووش؛ پەنابا؛ چڵەکا؛ کـەمتـرین نـەغـد؛ وردە؛ هـوردە؛ قۆشـە؛ قـەسـەری؛ فلـس؛ شـایی؛ فـەتـالی؛ پـارەیـەکـی زۆر کـەم ‹ایـن کتـاب را بـە پـشیزی نمی‌خرم: ئەم کتێبە بە بێزەیەک ناسێنم›.

**پـــشیمان** / pašîmān/: *صـفت.* پـــەشـــیمان؛ پـــەژیـــوان؛ پێـــژەوان؛ پێژیـــوان؛ پـــۆژوان؛ پۆشمـــان؛ پاشـــگەز؛ بازگـــەشـــت؛ ژیـــڤان؛ پوژمـان؛ ژوڤـان ‹اگـر پـشیمان شدی، بیـا پولـت را پـس بگیـر: ئـەگـەر پـەژیـوان بوویتـەوە، وەرە پارەکەت بگرەوە›.

▣ **پـــشیمان کـــردن**: قولپانـــدن؛ پـــەژیـــوان کردنەوە؛ پـەشـیمانەوەکـەردەی. هـەروەهـا: **پشیمان شدن**

**پـشیمانی** / pašîmānî، ـها/: *اسم.* پـەشـیمانی؛ پـــەژیـــوانی؛ پۆشمـــانی؛ ڤـــەرگـــەڕ؛ ناســور؛ حەشمەتی؛ ڤـەهـاتن: ١. هـەسـتێکی نـاخۆش لـە خـەم، وەڕەزی یـان دڵـمەنـدی کـە دوای کـــردنی کـــارێکی خـــراپ یـــان نـــەکـــردنی

کارێکی باش مرۆ دادەگرێ ‹سرانجام این کار پشیمانی است: ئاخری ئەم کارە پەژیوانیە› ٢. دەس‌بەردان و هەلگەڕانەوە لە بیر یان ئاکاری پێشوو ‹پشیمانی سودی ندارد: پەژیوانی بێ‌بەهرەیە›.

**پف** / pof/: *اسم. [گفتاری]* ١. فوو؛ پوف؛ پف؛ فیش ‹هر آن کس پف کند ریشش بسوزد: هەرکەسێک فووکا ڕیشی دەپرووزێ› ٢. با؛ وا؛ هەلماسی؛ پەنەم؛ ئاماس ‹چشمش پف کرده بود: چاوی بای کردبوو›.

▣ پف کردن: ١. نەپخاندن؛ پف تێ‌کردن ٢. هەلهاتن؛ هەلماسین؛ باکردن.

**پف آلود** / pofālûd/: *صفت.* باکردوو؛ هەلماسیاگ؛ هەلمساو؛ هەلمسیاو؛ پەنەماو؛ پەنەمیاگ؛ پەرمیاو؛ واکریا ‹صورت پف‌آلود: دەموچاوی باکردوو›.

**پفک** / pofak، ـها/: *اسم.* پوفەک: ١. شیرینیەکی سپی بە شکلی سەری قەندی بچووک کە لە سپیەی هێلکە، شەکر، کاکلەی پستە و شتی بۆنخۆش دروست دەکرێت ٢. پفەک؛ جۆری خۆراکی مندالان.

**پف کرده** / pofkarde/: *صفت. [گفتاری]* پەنەماو؛ پێف؛ باکردوو؛ باکردگ؛ هەلمساو؛ فوو تێ‌کراو؛ با تێ‌کراو.

**پف‌نم** / pofnam/: *اسم. [گفتاری]* دەمپرژە؛ ئەو ئاوەی کە بۆ نمدارکردنی شتێک (وەک پارچە یان ناو لەپی دەست) بەدەم دەیپژێنن.

**پفی** / pof î/: *صفت. [گفتاری]* هەلمساو؛ هەلماسیاگ؛ باکردوو؛ باکراو؛ باکراوە؛ واکریا؛ هۆرماسا.

**پفیدن** / pof îdan/: *مصدر. لازم.* ١. فوو کردن؛ پف‌کردن؛ نەپخاندن؛ واکەردەی ٢. باکردن؛ هەلماسین؛ هەلهاتن؛ هۆرماسەی؛ هۆرئامەی؛ باکردن و هەلهاتنی زەوین و خاک بەهۆی بەستنی ئەو ئاوەی تێیدایە ٣. *[کنایی]* با کردنە قول؛ بڕێتی لە تاریف‌کردن بە درۆ.

■ صفت مفعولی: **پفیده** (پف‌دراو)

**پفیوز** / pofyûz، ـها/: *صفت. [گفتاری]* ناکەس؛ بێ‌غیرەت؛ بێ‌ڕەگ ‹خودمانیم این رفیق تو هم خیلی پفیوز است: قسەی خۆمان بێ ئەم ڕەفیقەی تۆش زۆر ناکەسە›.

**پک** / pok، ـها/: *اسم.* مژ؛ مووف؛ مۆف؛ پۆک: ١. کار یان ڕەوتی مژ لێدانی شتێک (وەکوو جگەرە، قلیان و ...) ٢. ئەوندە دووکەل کە بە یەک هەناسە هەلدەکێشرێ ‹یک پک بزن: مژێکی لێدە›.

▣ پک زدن: مژ لێدان؛ مووف لێدان؛ مۆف لێدان؛ هەلمژین؛ مژ لێدانی جگەرە و...

**پکر** / pakar/: *صفت. [گفتاری]* داگیراو؛ نارەحەت؛ جاڕز؛ جاڕس؛ وەڕەز؛ وەڕەس؛ وەڕست؛ وێڕز؛ وێڕس؛ وارز؛ مەرس؛ عێدز؛ کەوەڕی؛ عاجز؛ حێجز؛ هۆراسان؛ بێ‌کەیف؛ گیانەسەر؛ کورکە؛ خۆکر؛ بێ‌حال؛ بێ‌واز؛ بێزار؛ داشکاو؛ دوزاخ؛ ئەوگار؛ مۆن؛ گرژ؛ فرۆز؛ مات و مەلوول؛ ‹از حرف من خیلی پکر شده: لە قسەکەی من زۆر داگیراوە›.

**پکری** / pakarî/: *اسم. [گفتاری]* وەڕەزی؛ پەکەری؛ نارەحەتی؛ قەلسی؛ داگیراوی؛ جاڕزی؛ دوزاخی ‹موجب پکری دوستان نباش: مەبە هۆی وەڕەزی دۆستان›.

**پکیدن** / pokîdan/: *مصدر. لازم. [گفتاری]* پووکانەوە؛ پووکیانەوە؛ پووچانەوە؛ پووچیانەوە؛ پووکیایوە؛ پووکەوە بوون؛ ڕووخان؛ وێران بوون؛ ڕووخیان؛ پرتووکیان؛ دارمان؛ تێک‌ڕمان؛ تێک قوپان؛ هاتنە خوارەوە؛ ئامایرە وار؛ ڕووخان؛ وریەی ‹تمام ساختمان در یک لحظه پکید و به صورت تل خاکستر درآمد: تەواوی مالەکە لە چاو لێکنانێکدا

پووکایەوە و وەک خوەڵەکەوانێکی پێهات›.

■ صفت مفعولی: **پکیده** (پووکاو)/ مصدر منفی: **نَپکیدن** (نەپووکان)

**پکیده** / pokîde/: *صفت. [گفتاری]* پووکیاو؛ پووکاو؛ پرتووکاو؛ پرتووکیاگ؛ ڕووخاو؛ ڕخیاو؛ پووکیا؛ وریا.

**پگاه** / pegāh/: *اسم. [ادبی]* کازیوە؛ کازێوە؛ بەرەبەیان؛ شەوەکی؛ شەوکی؛ سپیدە؛ سپێدە؛ سپیدەمان؛ سیسان؛ سفێدە؛ بوولێڵەی بەیان؛ سبزوو؛ سەرساعب؛ هەوەڵی ڕۆژێ؛ تاریک و ڕوونی بەیانی.

**پل** / pol، ـها/: *اسم.* ١. پرد؛ پر؛ پێڵ؛ پل؛ پل؛ پردی؛ کلکە ٢. پرداسا؛ هەر شتێکی وەک پرد ٣. پول؛ دۆخ یان حالەتێک لە وەرزشدا کە وەرزشکار بەپشتدا و لە بان دەست و پێوە یان لە سەر سەر و پێوە خۆی ڕادەگرێ ٤. *[برق]* پول؛ کەرەسەیەکی کارەبایی بۆ هەڵکردن یان کوژاندنەوەی چرا و ... ‹کلید یک پل: کلیلی یەک پول›.

▣ **پل باربر:** تیرِ حمال ☜ **تیر**

**پل بازودار:** پردی باسکەدار؛ پردی بازوودار؛ ئەو پردەی کە لە دوو بازوو پێکهاتووە.

**پل پیادەرو** ☜ **پل عابرپیاده**

**پل چوبی:** پردی چێوی؛ پردی چێ‌کراو لە چێو. هەروەها: **پل آجری؛ پل بتنی؛ پل فلزی**

**پل خربگیری:** *[کنایی]* داوەبوار؛ شوێنی تووش؛ جێگایەک کە پێویستە هێزایی و لێهاتوویی خۆت پیشان بدەی.

**پل راه‌آهن:** پردی هێڵی ئاسن؛ پردێ کە قەتاری بەسەردا دەڕوا.

**پل روگذر:** پردی ڕووبوار؛ پردێ کە لە سەر شەقامەوە داندرابێ.

**پل زیرگذر:** پردی ژێربوار؛ پردێ کە لە ژێر شەقامەوە بڕوا.

**پل سوارەرو:** پردی تایبەت بە ماشین.

**پل شناور:** پردی ئاوباز؛ پردی سەرئاو؛ پردێ کە بە بەستنەوەی چەن لۆتکە بە یەکەوە بۆ بواردن بە سەر ئاودا دروستی دەکەن.

**پل صراط:** *[اسلام]* پردی سیرات؛ پردی سەرات؛ پردی سەلات؛ پردۆ سەلاتی؛ پردی ڕۆژی پەسڵان کە بەسەر جەحەندەمدا دەڕوا و هەموو دەبێ لێی بپەڕنەوە.

**پل عابر پیاده:** پردی پیاسە؛ پردەبوار: **پل پیادەرو؛ پل هوایی**

**پل قپانی:** پردی قەپانی؛ پردێ کە وەک باسکی قەپان بان و خوار دەکا.

**پل قوسی:** پردی کەوانی؛ پردی بە شێوەی کەوان.

**پل گردان** ☜ **پل میانگرد**

**پل ماشین‌رو** ☜ **پل سوارەرو**

**پل معلق:** پردی هەڵواسراو؛ پردی ئاوێزان؛ پراهێلاویستی؛ پردی دالەقاو؛ پردی داشکاو؛ پردێ کە بە زنجیر و کابلەوە هەڵواسراوەتە دوو یان چەند پایەوە.

**پل میانگرد:** پردی جووڵاوە؛ پردی بزۆک؛ پرالقین؛ پردێ کە لە نێوانەوە وا دامەزراوە، ئەکرێ ئەم لا و ئەو لای پێ‌بکەی: **پل گردان**

**پل هوایی:** پردی هەوایی: ١. پردێ کە چەن میتر بەرزتر لە سەر ڕێگەوە دادەبەسترێ بۆ هاتوچووی پیادە ٢. *[مجازی]* پێوەندی هەوایی بە شێوەی هات و چووی بەپەیتا لە نێوان دوو شوێندا ٣. ☜ **پل عابرپیاده**

◘ پل آن طرف آب ماندن: *[مجازی]* شەو لەبری ناشتا بوون؛ کار تێکچوون؛ کار تێکشیەی؛ شپرزە بوون ‹اگر بە حرف تو عمل می‌کردم حالا پل مانده بود آن طرف آب: ئەگەر بە قسەی تۆم بکردایە ئێستا شەو لەبری ناشتا بووم›.

پل را آب بردن: ئاو پرد مالین؛ ئاو پرد بردن؛ ئاو پرد رامالین ‹بر اثر بارندگی شدید پل را آب برده بود: بەهۆی بارانی زۆرەوە ئاو پردەکەی مالیبوو›.

پل زدن/ بستن: پرد هەلبەستن؛ پرد بەستن؛ پرد هەلخستن.

پلها را پشت سر خود خراب کردن: *[کنایی]* ١. رێی گەڕانەوە لە خۆ بەستن ٢. لە باوان برین؛ پێوەندی خۆ لەگەل پێشوودا برین.

پلاتین / p(e)lātîn/: [فرانسوی از اسپانیول] *اسم.* پلاتین؛ زێری سپی؛ توخمێکی کانزاییە بە ژمارەی ئەتومی ٧٨ و کێشی ئەتومی ١٩٥.

پلاژ / p(e)lāj، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* پلاژ؛ رۆخەوار؛ لێوار: ١. شوێنی تەخت و خۆش‌بەرجەوەندی قەراخی ئاو ٢. مال و سامانی دروست‌کراو لەو شوێنەدا.

پلاژداری / p(e)lājdārî/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* پلاژداری؛ کاری بەڕێوە بردنی پلاژ بۆ کرێ ‹پلاژداری درآمد خوبی دارد: پلاژداری داهاتێکی باشی هەیە›.

پلاس / palās، ـها/: *اسم.* پلاس؛ پەلاس؛ نمالی؛ نەخالی؛ چەپال؛ چەپالک؛ هەپک؛ دەوار؛ جول؛ تەشکەبەرە؛ وەڕ؛ بەڕە؛ بەڕک؛ رایەخی کەم با؛ کەلپۆس؛ رایەخی زبر و ئەستووری لە مووی بزن دروست‌کراو.

◘ پلاس بودن: وێل بوون؛ ئاس و پلاس بوون؛ بەرەلا بوون ‹هر شب تا صبح توی کافه‌ها پلاس است: هەموو شەوێ تا بەیان لە بە قاوەخانەکاندا وێلە›. هەروەها: **پلاس شدن**

**پلاساندن** / palāsāndan, pelāsāndan/: *مصدر. متعدی.* // **پلاساندی:** پەژمەراندت؛ **می‌پلاسانی:** دەپەژمەرێنی؛ **بپلاسان:** بپەژمەرێنە// پژمەراندن؛ پژمراندن؛ ژاکاندن؛ ژاکانن؛ چرچاندن؛ سیس کردن؛ سیسەل کردن؛ ژاکنەی؛ سیسنەی ‹گرما گلها را پلاساند: گەرما گولەکانی پەژمەراند›.

■ صفت مفعولی: **پلاسانده** (پەژمەرێنراو)/ مصدر منفی: **نَپلاساندن** (نەپەژمەراندن)

**پلاستر** / pelāster/: [انگلیسی] *اسم.* ١. مووچرکە؛ مووچرکە؛ مووچرک؛ مووچرک؛ مچورک؛ تەزوو؛ لەزگە؛ تەزی لەش ٢. موشامبە؛ مشەمما؛ مشەما؛ چەسپی بە پێستەوە لکاندن بۆ دەرمان.

**پلاستیک** / p(e)lāstîk، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ناوی گشتی بۆ زۆرێک بەرهەمی پولیمیری: *الف)* دەلق؛ دلق؛ مشەما؛ جۆری ناسکیە بە ڕەنگی جۆراوجۆ (وەک سفرە) *ب)* باغە؛ جۆری وشک و ڕەقیە (وەک بۆ قاپ و کاسە) *ج)* باتە؛ لاستیق؛ لاسیق؛ جۆری نەرمیە بۆ کەوش و پێلاو *د)* قایش؛ بە شێوەی شریتە کە ئەم جۆرە کێشی دێت.

**پلاستیکی** / p(e)lāstîkî، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* دەلقی؛ دلقین؛ پلاستیکی؛ باغەیی؛ قایشی.

**پلاسما** / p(e)lāsmā/: [فرانسوی از آلمانی] *اسم.* پلاسما: ١. *[پزشکی]* بەشی تراوی خوێن کە زۆربەی ئاوە ٢. *[فیزیک]* چوارەمین حالەتی ماک کە لە تینی یەکجار زۆردا بەدی دێ و تێیدا ئیلکترون لە ناوکی ئەتوم جوێ دەبێتەوە.

**پلاسنتا** / p(e)lāsentā/: [؟] *اسم.*

[زیست‌شناسی] جفت؛ لف؛ ئاواڵ‌منداڵ؛ یاوەرە؛ گر؛ شادەمارێک کە لە پزداندا بژیو بە ئاولەمە دەگەیێنێ.

**پلاسیدگی** / palāsîdegî, pelāsîdegî /ها/: اسم. ژاکاوی؛ ژاکیاگی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ژاکیان.

**پلاسیدن** / palāsîdan, pelāsîdan /: مصدر. لازم. [گفتاری]// **پلاسیدی**: پەژمەرای؛ **می‌پلاسی**: دەپەژمەری؛ **بپلاس**: بپەژمەرە// ژاکان؛ ژاکیان؛ ژاکین؛ ژاکیەی؛ پەژمەران؛ پەژمران؛ سیسیان؛ سیسیەی؛ سیس بوون ‹گُلها از گرما پلاسیده‌اند: گوڵەکان لە گەرما ژاکاون›. هەروەها: **پلاسیدنی**

■ صفت مفعولی: **پلاسیده** (پەژمەراو)/ مصدر منفی: **نَپلاسیدن** (نەپەژمەران)

**پلاسیده** / palāsîde, pelāsîde /ها/: صفت. [گفتاری] ژاکاو؛ ژاکیاگ؛ پەژمەراو؛ سیسیاو ‹گلهای پلاسیده را دور ریختم: گوڵە ژاکاوەکانم فڕێدا›.

**پلاک** / p(e)lāk /ها/: [فرانسوی]/اسم. ١. پلاک؛ پێلاک؛ پەلاک؛ لەک؛ ژمارگە؛ تیکەیەکی کانزا، تەختە یان قاقەز کە لە سەریەوە ناونیشانێک دەنووسرێ و هەڵدەواسرێ یان دادەنرێ ٢. دروشم؛ تیکەی کانزای (بەتایبەت بەنرخ) بە دروشم و نیشان لە سەریەوە، بە شێوەی ملوانک یان بازنە ٣. نیشان؛ نەوارێکی پلاستیکی کە ناونیشانی لە سەر دەنووسن و لە دەوری باسکی منداڵی کۆرپەوە دەپێچن ٤. پارچە؛ قەوارە؛ قەبارە؛ زەوینی دیاریکراو بە دروشمێکی تایبەتی خۆی ٥. پەترۆ؛ پەترۆک؛ پەترۆکە؛ توێکڵی سەر زام: **کَژنە**

**پلاکارت** / p(e)lākāt /: [فرانسوی] ☜ **پلاکارْد**

**پلاکارد** / p(e)lākārd /ها/: [فرانسوی]/اسم. پلاکارت: ١. وەرەقێکی بە سەر دارەوەکراو کە لە خۆپیشاندانا بە دەستیەوە دەگرن ٢. نووسراوەی بە سەر پارچەوە بۆ چاوڕۆشنی، ئازیەتباری و...

**پلاکت** / p(e)lāket /ها/: [فرانسوی]/اسم. ☜ گِردەی خون، **گردە**

**پلان** / p(e)lān /ها/: [فرانسوی]/اسم. پلان: ١. نەقشەی ڕووپەڕی تەخت ٢. [مجازی] نەقشەی خانوو بەرە، ماشێن و... ٣. دیمەنێک لە فیلم کە لە یەک نۆبە و بە بێ دابڕانی فیلم هەڵدەگیردرێ.

**پلانتاریم** / p(e)lānetār(i)yom /ها/: [فرانسوی]/اسم. [نجوم] ئاسماندۆز؛ ئاسمان‌نوێن؛ پلانتاریۆم: ١. هەرکام لەو کەرەسانەی وا تەنگەلی ئاسمانی نیشان دەدا ٢. خانوویەک وەکوو گومبەز کە تێیدا تەنگەلی ئاسمانی دەبینن.

**پلانکتون** / p(e)lānkton /ها/: [فرانسوی از آلمانی]/اسم. پلانکتۆن؛ گیاندارێکی وردیلەی ناو دەریایە و خۆراکی زۆربەی دەریاژیانە.

**پلئیستوسن** / p(e)le'îstosen /: [؟]/اسم. پیلئیستۆسین؛ دووهەم دەور لە چوارەمین دەورانی زەوی‌ناسی.

**پلتیک** / pol(e)tîk /ها/: [فرانسوی]/اسم. [گفتاری] فەن؛ فیتەلە؛ کردەوەی تێکەڵ بە زرک و زیندوویی و سیاسەتەوە ‹تو که اهل پلتیک و کلک نبودی: تۆ خۆ فەن و فێڵباز نەبووی›.

⊡ پلتیک زدن: بە گوڵ دەرکردن؛ فێڵ کردن؛ کەلەک لێدان؛ عیلم‌کردن؛ ‹نمی‌خواست بگوید، من هم پلتیک زدم و گفتم خبر دارم: نەیدەویست قسە بکا، منیش بە گوڵ دەرم‌کرد وگوتم بۆ خۆم خەبەرم هەیە›.

**پلس** / polos /: [؟]/اسم. [مکانیک] پولۆس؛ کەرستەیەک لە ماشیندا کە چەرخ

دەخولێنێتەوە.

**پلشت** / palašt, pelešt، ـهـا/: *صفت. [ادبی]* پیس؛ پۆخڵ؛ چەپەڵ؛ گەن؛ گەنەڵە؛ گەمار؛ گەنار؛ پەلەشت ‹زاغکی پلشت: قەلێکی چەپەڵ›.

**پلشتبر** / palaštbar, pelešt- ـهـا/: *صفت.* پیسیبەر؛ پیسیبڕ؛ پیسیسڕ؛ گەنبەر؛ گەناربەر ‹مایع پلشتبر: تراوی پیسیبەر›.

**پلشتبری** / palaštbarî, pelešt- ـهـا/: *اسم.* گەماربەری؛ پیسیسڕی؛ پیسیبەری؛ گەنبەری.

**پلشتی** / palaštî, peleštî/: *اسم. [ادبی]* پیسی؛ چەپەڵی؛ پۆخڵی؛ پەلەشتی؛ پەلشتی؛ گەنی؛ گەماری؛ گەناری.

**پلق ـ پلق** / peleqpeleq/: *صوت.* پڵقە پڵق؛ قوڵتەقوڵت؛ دەنگی کوڵانی ئاو و تراویتر ‹سماور پلق ـ پلق می‌جوشید: سەماوەرەکە قوڵتەقوڵت ئەکوڵیا›.

**پلک** / pelk، ـهـا/: *اسم.* پێڵوو؛ پیلۆ؛ پێڵ؛ پێڵگ؛ پێڵێ؛ پەلک؛ بەلگ؛ کۆپک؛ قەپەک؛ قەپێلک؛ پێڵە؛ مشکولی؛ مچکولی؛ هەر یەکە لە دوو پێستەی ناسکی سەر چاوی مرۆ و زۆربەی گیانلەبەران.

▣ **پلک سوم**: پێڵی سێهەم؛ پەردەیەکی بزۆکی ڕۆشنە لەژێر پێڵی ژێرین یان سووچی ژوورەوەی چاوی بڕێ لە گیاندارانەوە.

▣ پلک به هم نزدن: ۱. چاو نەترووکاندن؛ چاونەقووچان؛ چاو نەقونجان؛ چەم نەقووجنەی؛ چاو نەبەستن؛ چەم پێوەرە نەنیەی ۲. *[کنایی]* چاو لێ دانەخستن؛ چاو لێ هەڵنەگرتن؛ چەم چنە نەوسەی؛ چاو لێ کل نەکردن؛ خولیای زۆر بۆ دیتن و ڕوانین بوون ‹نگاهش را دوخته بود به تلویزیون و پلک به هم نمی‌زد: چاوی لە تەلەویزیۆنەکە هەڵنەدەکرت›.

**پلک روی هم نگذاشتن**: *[مجازی]* چاو بەیەکدا نەنان؛ چاو بەیەکا نەنیان؛ ورینگ نەدان/ نەدەی؛ خەو نەهاتنە بان چاو؛ چەم نەنیەی پێوەرە؛ تۆزقاڵێکیش نەنووستن ‹تا صبح پلک روی هم نگذاشتم: تا بەیانی چاوم بەیەکدا نەنا›.

**پلک سنگین شدن**: *[مجازی]* چاو قورس بون؛ چاو شۆڕەوە بوون؛ خەو هاتنەچاو؛ خەو پەڕینە چاو؛ خەو داگرتن؛ چەمێ نیشتەی ‹کم‌کم پلکهایش سنگین شد: وردەوردە چاوی قورس بوو›.

**پلکان** / pellekān، ـهـا/: *اسم.* پلەکان؛ پلێکان؛ پێپلیکان؛ پێپلیک؛ پێپیلکە؛ ڕێپێلکە؛ پاچینە؛ پاپەنجە؛ دەرنجە؛ قادرمە؛ قالدرمە؛ خرک؛ حەوق؛ ڕازوند.

▣ پلکان اضطراری ☜ **پلکان نجات**

**پلکان برقی**: پلەکانەی بەرقی؛ دەرنجە بەرقی.

**پلکان مارپیچ**: پلیکانەی پێچ.

**پلکان متحرک**: پلەکانەیەک کە دەگۆزرێتەوە.

**پلکان نجات**: پلەکانی دەرباز بوون؛ جۆرێ پلیکان لە دەرەوەی ماڵە بەرزەکانەوە، بۆ هەلاتن لە وەختی ڕووداوی ناکاودا: **پلکان اضطراری**

**پلکسی گلاس** / peleksîgelās, pleksîglās/: [انگلیسی] /*اسم.* پلیکسیگلاس؛ جۆرێک پەلاستیکی وەک شیشە.

**پلکیدن** / pelekîdan/: *مصدر. لازم.* //**پلکیدی**: خولایتەوە؛ **می‌پلکی**: دەخولیەوە؛ **بپلک**: بخولێەوە// خولانەوە؛ خول خواردن؛ گەڕان؛ سووڕانەوە؛ سووڕخواردنەوە؛ پیاسە کردن؛ هاتوچوو لە پەگالی کەسێ یان شتێک ‹امروز جوانی این طرفها می‌پلکید: ئەوڕۆ

گەنجێک بێرەدا نەخولایەوە›.

■ مصدر منفی: نَپلکیدن (نەخولانەوە)

**پلمب** / p(o)lomb، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ١. [نامتداول] سۆ؛ سرۆ؛ سرب ٢. گالە؛ پلۆم؛ کلۆم ٣. دەس‌مۆر؛ سەرمۆر؛ پلۆم.

**پلمه‌سنگ** / polmesang/ ☜ سنگ لوح، **سنگ**

**پلنگ** / palang/: اسم. ١. سێهەم ساڵ لە ساڵگەلی تەقویمی تورکستان ☜ **تقویم** ٢. /ـها؛ ـان/ پلنگ؛ پلینگ؛ پەڵەنگ؛ پالنگ؛ دڕندەی بەناوبانگ.

**پلنگی** / palangî/: صفت. پەڵە ـ پەڵە؛ پڵ‌پڵی؛ پلینگی؛ پلنگ‌ئاسا؛ پلنگانە؛ پالنگین؛ بە پێستی خاڵ‌ـخاڵی زەرد و ڕەشەوە ‹گربه پلنگی: پشیلەی پلنگی›.

**پلنوم** / p(e)lenom، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [سیاست] پلونوم؛ کۆ بوونەوەی سەرۆکان؛ کۆڕێ کە بە بەشداری هەموو ئەندامانی ڕێبەرایەتی یان کومیتەی ناوەندی ڕێکخراوەیەکی سیاسی پێک دێ.

**پلو** / polow, polo:، ـها/: اسم. پلاو؛ پیلاڤ؛ پراو؛ برێنجینە؛ بەرزە؛ شێوی برنج؛ چێشتی برنجی بە پاڵوینە پاڵێوراو؛ چێشتی گراری پاڵێوراو ‹ماهی پلو؛ باقالی پلو؛ سبزی پلو: ماسی پلاو؛ باقلە پلاو؛ سەوزی پلاو›.

**پلوپز** / polowpaz, polo:-، ـها/: اسم. پلاوپەز؛ دەفرێکی کارەباییە بۆ دروست کردنی پلاو.

**پلوتون** / p(e)loton, poloton/: [فرانسوی] اسم. [نجوم] پلۆتون؛ تەنێکی ئاسمانی کە تا ئەم دواییانە بە نۆهەمین گەڕۆکی خۆرەتاوی دەناسرا.

**پلوتونیم** / p(e)loton(i)yom/: [فرانسوی] اسم. پلوتونیۆم؛ توخمی کیمیایی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤی، لە دەستەی ئاکتینیدەکان، بە ژمارەی ئەتومی ٩٤.

**پلوخوری** / polowxorî, polo:-، ـها/: اسم. ١. پلاوخۆری؛ قاپی تایبەت بۆ پلاو تێکردن ‹ظرف پلوخوری: قاپی پلاوخۆری› ٢. [مجازی] پلاوخۆران؛ پلاوخواردن؛ مێوانی؛ میوانی؛ مێمانی ‹لباس پلوخوری: جل‌وبەرگی پلاوخۆری›.

**پلورالیسم** / p(u)lûrālîsm/: [فرانسوی] ☜ **کثرت‌گرایی**

**پلونیم** / polon(i)yom/: [فرانسوی/ انگلیسی] اسم. پۆلونیۆم؛ توخمی کیمیایی ڕادیۆئەکتیڤی وەک کانزا، بە ژمارەی ئەتومی ٨٤ و کێشی ئەتومی ٢١٠.

**پله** / pelle، ـها/: اسم. ١. پلە؛ پلیکە؛ پلیکان؛ پلیگانە؛ پلەکانە؛ پلەکان؛ سازراوەیەکی تەختی دەسکرد بە بەرزایەکی کەمەوە ‹روی پله نشسته بود و روزنامه می‌خواند: لە سەر پلەکە دانیشتبوو، ڕۆژنامەی دەخوێندەوە› ٢. پلەپەیژە؛ پاپلە؛ پێ‌پلە؛ پێ‌پیلکەی نەردیوان ‹پله‌ی نردبان پوسیده بود و شکست: پلەی نەردیوانەکە پوابوو، شکا› ٣. پلەکان؛ پلەکانە؛ پلیکان؛ پلیکە؛ پلیکانە؛ ڕاپلە (زۆرتر بە شێوەی کۆ) ‹پله‌ها را بگیر و برو بالا: پلەکان لێدە بۆ سەرەوە› ٤. [مجازی] پلە؛ پا؛ پاگە؛ قۆناغ؛ ئاستێک لە بەرەو پێش چوون کار یان دیاردەیەک ‹اگر این کار خوب تمام بشود، چند پله جلو می‌افتیم: ئەگەر ئەم کارە باش بەڕێوە بچێ، چەند پلە پێش دەکەوین› ٥. پەینجە؛ پێنجە؛ پەیژە؛ پەیجە؛ پاپەینجە؛ پێسترک؛ پەییسک؛ حەوق؛ دەرج؛ نەردیوان.

▣ پله خوردن: [گفتاری] پلە خواردن؛ پلێ وارەی؛ بە پلە و پەلیکە بوون ‹زیرزمینش ٢٠ تا پله می‌خورد: ژێرزەوینەکەی ٢٠ پلە دەخوارد›.

**پله ـ پله** / pellepelle/: صفت. پلە ـ پلە؛ پلەوپلەوەن؛ بەرز و نزم؛ چاڵ و بەرز؛

چالـه_چالـه؛ قوتکـه_قوتکـه؛ قـۆرت_قـۆرت؛ قۆرت‌قۆرتین؛ قولـچه_ قولـچه ‹چرا کف حیاط این‌طور پله‌پله است؟: بۆچی حـه‌وشـه‌کـه ئـاوا چـاڵ و پـه‌رزه؟›.

**پلـه_پلـه** ۲: قیـد. [مجـازی] بـه‌ره_بـه‌ره؛ کـه‌مـه_کـه‌مـه؛ پلـه_ پلـه؛ وه‌ره_ وه‌ره؛ واره_واره؛ قۆنـاغ_قۆنـاغ؛ هێنـده_ هێنـده؛ ڕێزه_ ڕێزه؛ چکـه_چکـه؛ نـه‌ختـه_ نـه‌ختـه؛ ورده_ ورده؛ سه‌وره_سـه‌وره ‹پله‌پله پیشرفت کرد تا بدین مرحله رسید: بـه‌ره‌_ بـه‌ره بـه‌ره‌و پـێش چوو تا به‌م قۆناغه گه‌یشت›.

**پلی** / pelî، ـها/: [؟]/اسم. پلیسه؛ چـه‌شنێک دروومانه که تێیدا چینـه‌کـان ده‌کـه‌ونـه سـه‌ر یه‌ک: **پیلی**

**پلیپ** / polîp، ـها/: [؟]/اسم. پولیـپ؛ جۆرێـک لکه لـه نـاو لـووت، میزدان، منالـدان و زگـه‌وه دروسـت ده‌بـێ و زۆر جـارانیش ئـه‌گـه‌ر لایبه‌ن، دیته‌وه.

**پلی‌تکنیک** / polîteknîk/: [فرانسوی]/اسم. پولی‌ته‌کنیک؛ دامه‌زراوه‌ی فێرکاری بالا.

**پلید** / palîd/: صفت. [ادبی] پـیس؛ چـه‌پـه‌ڵ؛ گـلاو؛ گـه‌مـار؛ کـه‌مـار؛ تـڕۆڵ؛ لـه‌وت؛ قرێـژ؛ کوتی؛ ته‌رێف؛ سـردار؛ ناپـاک یـان تێکـه‌ڵ بـه ناپـاکی ‹دست پلید: ده‌ستی پـیس؛ فکر پلید: بیری گلاو›.

**پلیدی** / palîdî، ـها/: اسم. [ادبی] پیـسی؛ گـه‌مـاری؛ چـه‌پـه‌ڵـی؛ چـڵکنی؛ کـه‌سـانه‌ت؛ ناخـاوێنی؛ مـرداری ‹پلیدی جامـه: پیسی جل‌وبه‌رگ؛ پلیدی روح: پیسی رۆح›.

**پلیس** / polîs/: [فرانسوی]/اسم. پـولیس؛ پـۆلیس: ۱. شـاره‌وانی؛ شـاره‌بـانی؛ مـه‌زرینگـه‌ی بـه‌رپرسـی هێمنایـه‌تی وڵات ‹پلیس برای آسایش مردم است: پولیس بۆ ئاسایـشی خـه‌ڵـکه› ۲. شـاره‌وان؛ شـاره‌بـان؛ هه‌رکام لـه کارگێـڕانی شـاره‌وانی ‹پلیس آنها را دستگیر کرد: پولیس گرتنی›.

▣ پلیس راه: ڕێـوان؛ ئاگـاداری ڕێگـه؛ پۆلیـسی ڕێگه.

پلیس راهنمایی: پۆلیسی ڕێ و بان.

پلیس سیاسی: پۆلیسی ڕامیاری.

پلـیس مخفـی: پۆلیـسی نهـێنی؛ پۆلیـسێک که به نهێنی و نه‌ناسراوی کار ده‌کات.

**پلیسه** / pelîse, pilîse، ـها/: [فرانسوی] صفت. چین_چـین؛ کـه‌ل_کـه‌ل: ۱. دروومانێـک بـه شێوه‌ی چین له‌سـه‌ر چینی وه‌ک یـه‌ک و لـه پـشت یـه‌کـه‌وه ‹دامـن پلیـسه: داوێـنی چـین_چـین› ۲. بـڕ_ بـڕ؛ بڕکـه_ بڕکـه؛ قه‌راخه‌یه‌کـی نارێـک بـه شـێوه‌ی کـه‌ل_کـه‌ل بوو ‹لبه‌ی پلیسه: قه‌راخی بڕ_ بڕ›.

**پلیسی** / polîsî/: [فرانسوی] صفت. پۆلیـسی: ۱. سـه‌بارەت بـه پـولیس ‹فیلم پلیسی: فیلمی پۆلیـسی› ۲. ئـۆگر و خـووگر بـه پـولیس ‹حکومت پلیسی: ڕژیمی پولیسی›.

**پلیکا** / polikā/: [؟]/اسم. پولیکـا؛ نێـوی بازرگـانی لووله و پێـوه‌ندیه‌کـانی لـه جنسی پلاستیک.

**پلیکان** / pelîkān، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ماسی‌چنه؛ سه‌قا؛ سـه‌قـاو؛ سـه‌قـاقوش؛ قوتـان؛ سـه‌قـاترش؛ زه‌رووڵـه؛ چـه‌ڵـک؛ کـه‌ڕاوی؛ که‌راقی؛ که‌ڵـک؛ چـه‌ڵـک؛ باڵـدارێکی زه‌لامـی ماسـی‌خـۆره، قـورتمێکی وه‌کـوو کیـسه‌یه‌ک لـه خـوار دندووکـه‌وه هـه‌یـه، ماسـی و ئـاوی تێده‌کا.

**پلی‌کپی** / polîkopî، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ۱. کـۆپی؛ بـه‌رگـی نووسـراوه‌ی لـه ڕووی ئـه‌سڵ گیراو ۲. پولی‌کوپی؛ ئامرازی کۆپی‌گرتن.

▣ پلی‌کپی کردن: کۆپی‌گرتن.

**پلی‌کلینیک** / polîkilînîk, -k(e)lînîk، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پـولی‌کلینیـک؛ ده‌رمانگـا و نه‌خۆشخانه‌یـه‌ک کـه بـۆ ده‌رمـانی نـه‌خۆشـان

و ئازارگەلی جۆراوجۆر دابین‌کراوە.

**پلیور** / polîver، ـها/: [از انگلیسی] /اسم. پولیوەر؛ جاکەت؛ کراسی چنراوی بەتایبەت بەرۆک بەستراو.

**پلیوسن** / pelyosen/: [فرانسوی] /اسم. پلیوسێن؛ پێنجەمین و ئاخرین دەور لە دەورانی سێهەمی زەوی‌ناسی.

**پ.م.** / pe.mîm/: [فارسی/ عربی] مخفف. پ.ز.؛ کورت‌کراوەی «پیش از میلاد» پێش لە زایین (لە دایک بوونی عیسای پێغەمبەر).

**پماد** / pomād، ـها/: [فرانسوی از ایتالیایی] /اسم. مەلهەم؛ مەرهەم؛ مەلحەم؛ هەتوان؛ دەرمانی سەر زام ‹پماد سوختگی: مەلهەمی سووتاوی›.

**پمپ** / pomp، ـها/: [فرانسوی] /اسم. پومپ؛ تورمپا؛ ئامرازی هەلکشان یان پژاندنی تراو.

▣ پمپ آب: پومپاو؛ ترومپای ئاو.

پمپ باد: ترومپا؛ پومپ با: ۱. شوێنی با تێ‌کردنی تەگەرەی گەرۆک و... ۲. ئامرازی با تێکردن.

پمپ بنزین: پۆمپی بەنزین: ۱. شوێنی فروشتنی بەنزین و نەوت و... ۲. دەزگای ڕژاندنی بەنزین بۆ ناو باکی ماشێن.

**پمپاژ** / pompāj/: [فرانسوی] /اسم. پومپاژ؛ هەلکێشی؛ هەلخەری؛ کار یا ڕەوتی ڕاگوێزانی تراو بەهۆی پۆمپەوە ‹آب را تا ارتفاع زیادی پمپاژ می‌کند: تا بەرزاییەکی زۆر ئاوەکە هەلدەخا›.

**پناباد** / panābād، ـها/: /اسم. [قدیمی] پەنابا؛ پەناوا؛ پەنابات؛ دەشایی؛ سکەی بەرامبەر بە ۵۰ دینار؛ پارەیەکی کۆنی ئێرانە، دوانی دەبووە قەرانێک.

**پنالتی** / penāltî، ـها/: [انگلیسی] /اسم. ۱. [ورزش] پنالتی؛ ئەو تاوانەی کە لە سۆنگەی هەلەی یاریکارێکەوە بەر ئەکەوێ ۲. تاوان؛ جەریمە.

**پناه** / panāh/: /اسم. پەسێو؛ پەنا؛ دالدە؛ هانا؛ چەپالە؛ ئەنوا؛ ئەوەی کە دەبێتە هۆی ڕزگاری یان پەڕینەوە لە مەترسیەوە.

▣ پناه بر خدا: پەنا بەخوا؛ خوا تۆبە؛ بۆ خۆپارازتن لە بەلا دەگوترێ.

▣ پناه آوردن: پارێزگاری خواستن؛ دالدە هێنان؛ هانا هاوردن؛ پەنا هێنان؛ هاتنە بەر دالدەوە؛ پەنا ئاردەی ‹از شدت سرما به زیر صخره‌ای پناه آوردند: لە بەر توفی سەرما هانای هێناوە ژێر گابەردێ›.

پناه جستن: ڕاخوستن؛ پەنا بەر بوون؛ پەنا گرتن؛ پەنا بردن؛ بۆ پەنا گەڕان.

پناه دادن: پەنادان؛ قەفاندن؛ هەڤاندن؛ حاواندنەوە؛ هانادان؛ هێوراندن؛ هەوێنایش؛ ڤەحەواندن؛ هێڤراندن؛ چەپالەدان؛ دالدەدان؛ جێگەدان؛ پەنا دەی.

پناه گرفتن: پەناگرتن؛ خۆ پەنادان؛ خۆ حەشاردان؛ خۆ قەرەوال‌دان؛ پەنا گێرتەی؛ بۆ ڕزگاری لە مەترسیەک، لە شوێنێکدا خۆ شاردنەوە ‹پشت دیوار پناه گرفت: لە پشت دیوارەکەوە خۆی حەشاردا›.

**پناهجو** / panāhcû، ـها؛ ـیان/: /اسم. پەنابەر؛ هانابەر؛ پەناخواز؛ پناواز ‹پناهجویان کویتی وارد عربستان شدند: پەنابەرانی کوەیتی گەییشتنە عەرەبستان›.

**پناهگاه** / panāhgāh، ـها/: /اسم. پەسیو؛ پەناگا؛ پەناوا؛ پەنامگا؛ سامە؛ گیان‌پەنا؛ نوا؛ ئەنوا؛ نوانی؛ مالتیە؛ قایە؛ دالدە؛ لیز؛ لیزگە؛ وار؛ قەف؛ چراخ؛ چەپالە؛ جێگەی حاوانەوە.

**پناهندگی** / panāhandegî، ـها/: /اسم. پەنابەری؛ پەنابەریەتی؛ کار یان ڕەوتی پەنا

بـردن ‹او از ایتالیـا تقاضـای پناهندگی کـرد: لـه ئیتالیاوه داوای پەنابەری کرد›.

پناهنده / panāhande، ـها؛ ـگان/: اسم. پەنابەر؛ پەناهێناو؛ دەخیل؛ لاجە؛ دالدەخواز؛ گیانداریٚ کە لە بەر مەترسی پەنا دەباتە بەر کەسیٚ یان شوێنێک.

▣ پناهندەی اجتماعی: پەنابەری کۆمەلایەتی؛ کەسیٚ کە لە بەر توند و تیژی ئایینی یا کۆمەلایەتی، بشێوە یا شەڕ لە ولاتی خۆیدا، پەنا دەباتە ولاتێکی تر.

پناهندەی سیاسی: پەنابەری سیاسی؛ کەسیٚ کە لە بەر خەباتی سیاسی و دژایەتی لەگەڵ حکوومەتی ولاتی خۆیدا، ئیتر ناتوانیٚ ئازاد لەویٚ بژی و پەنا دەباتە بەر ولاتێکی تر.

▣ پناهنده شدن: پەنابەر بوون؛ پەنابردن؛ بۆ دووری لە مەترسی بە کەسێک یان بۆ شوێنێک پەنا بردن.

پناهیدن / panāhîdan/: مصدر. لازم. *[نامتداول]* هێوران؛ هەڤان؛ هێورین؛ پەنابەر بوون؛ پەنا بەردەی.

پنبه / pambe, panbe، ـها/: اسم. لۆکە؛ لۆک؛ لکە پەموو؛ پەمۆ؛ پەمگ؛ پەمبۆ؛ پەنبۆ؛ پەنبی؛ پەمە؛ پەمبی؛ پەمپە؛ ور: ۱. گیای لۆکە؛ پووشی پەموو ۲. لووکە؛ تاڵ و ریشالی (زۆرتر سپی) وەک خووری؛ بەرهەمی گیای لۆکە.

▣ پنبەی درختی: پەمووی درەختی؛ ریش و ریشالی دەوری میوەی بڕیٚ لە داران (وەک نارگیل، گەنمەشامی و ...).

پنبەی کوهی: پەمۆی کێوی؛ پەمۆ کێفی؛ جۆرێک پەمووی نەسووچ بە ریشالگەلی نەرم و جوانەوە.

پنبەی نسوز: پەمۆی نەسۆچ.

▣ پنبە بە ریش کسی گذاشتن: *[کنایی]* ماستاو بۆ کەسێک کردن؛ دالان بۆ کەسێک رامالین؛ بۆ کەسێک زوان چەوری کردن؛ پیاز بۆ کەسیٚ پاک کردن؛ کلک بۆ کەسێک بادان؛ کلکەسووتە بۆ کەسێک کردن؛ خولتەی کەسێک کردن ‹حالا نمی‌خواهد این‌قدر پنبە بە ریش او بگذاری: ئێستە نایەویٚ ئەوەندە ماستاوی بۆ بکەی›.

پنبە در گوش کردن: *[کنایی]* گویٚ ئاخنین؛ خۆ کەڕکردن؛ گوێچکە لیٚ خەفاندن؛ گویٚ لیٚ داخستن؛ کلک پیٚ هەلپەساردان؛ گۆشیٚ ئاخنەی؛ گویٚ نەگرتن بۆ قسەی خەلکی ‹مگر پنبە در گوشت کردەای کە حرف مرا نمی‌فهمی: مەگەر گویٚت ئاخنیوە لە قسەم تیناگەی›.

پنبە زدن: پەمبیٚ قەژاندن؛ پەموو شی کردنەوە.

پنبەی کسی را زدن: *[مجازی]* بەڕی کەسێک داماڵین؛ سووک و چرووک کردنی کەسێک؛ عەیب‌گەلی کەسێک دەرخستن و بیٚ‌ئابڕووکردنی ‹دیروز رادیوها پنبەی آقای وزیر را زدند: دوێنیٚ رادیۆکان، بەری ئاغەی وەزیریان داماڵی›.

پنبەی لحاف کهنه باد دادن: *[کنایی]* کای کۆنە وەبادان؛ کێشانە بان؛ کۆراندنەوە؛ قسەگەلی ڕابردوو (وەک شانازی یان گلەیی و سکالا) نویٚ‌کردنەوە ‹باز می‌خواهی پنبەی لحاف کهنه باد بدهی؟: هەمیسان دەتەویٚ کای کۆنە وەبا دەی؟›.

با پنبە سر بریدن: *[مجازی]* نەرمەبڕی کردن؛ کلک پێوەکردن؛ بە زرینگی و شیرین زمانی خەلکی فریودان ‹از آنهاست کە با پنبە سر می‌برد: لەوانەیە وا نەرمەبڕی دەکا›.

**پنبه‌ای** / pambe'î, panbe'î، ـها/: صفت. لۆکەیی؛ پەموویی؛ پەمۆیی؛ پەمەیی؛ پەمووئاسا؛ پەمەچەشن: ۱. لە جنسی پەموو ‹پارچەی پنبه‌ای: پارچەی پەموویی› ۲. بە بیچمی پەموویییەوە ‹گلهای پنبه‌ای: گوڵە پەموویەکان› ۳. [گیاه‌شناسی] تووکن؛ داپۆشراو لە کولکی نەرم و لیکئاڵاوی سپی.

**پنبه‌دانه** / pambedāne, panbe-، ـها/: اسم. ناوکەپەمۆ؛ ناوکە لۆکە؛ پەموانە؛ دەنکە پەموو؛ پەمۆدانە؛ پەمەتۆهە؛ پەمبۆدانە؛ دەنکی گیای پەمۆ.

**پنبه‌زار** / pambezār, panbe-، ـها؛ ـان/: اسم. [ادبی] پەمۆجاڕ؛ دەشتەپەمۆ؛ کێڵگەی پەمۆ.

**پنبه‌زن** / pambezan, panbe-، ـها/: اسم. ۱. پەڕەکەر؛ کەڤانژەن؛ کێرنج؛ جیکەنە؛ ئامرازی کولکە بە کەوان شیکەرەوە ۲. هەلاج؛ حەلاج؛ کەسێ کە بە کەوان لۆکە و کولکە شی دەکاتەوە. هەروەها: **پنبه‌زنی**

**پنبه‌کار** / pambekār, panbe-، ـها؛ ـان/: اسم. پەمووکاڵ؛ پەمووکار؛ کەسێ کە پیشەی پەمووکاریە.

**پنبه‌کاری** / pambekārî, panbe-/: اسم. پەمووکاری: ۱. پەمووکاڵی؛ پەمووکاڵین؛ کار یان ڕەوتی چاندنی پەموو ‹در مریوان سرگرم پنبه‌کاری است: لە مەریواندا خەریکی پەمووکاریە› ۲. ـها/ کێڵگەی پەموو؛ مەزرای پەموو ‹گاو رفته توی پنبه‌کاری، خرابی بار آورده: گاکە چۆتە نێو پەمووکاریەکەوە و زیانی داوە›.

**پنت** / pont، ـها/: [انگلیسی]اسم. پۆنت: ۱. یەکەی ئەندازەی پیت، کە لە ئێراندا ۰٫۳۷ میلیمیترە و لە بریتانیا و ئامریکادا ۰٫۳۵ میلیمیتر ۲. مەودای پیت هەر بەو ئەندازەوە * پُنط

**پنتی** / pentî، ـها/: صفت. [گفتاری] ۱. شپرز؛ ئاڵۆز؛ شپڕۆڵ؛ شپڕ؛ شێلە و پێلە؛ هەڵشێواو ‹اتاق پنتی: ژووری شپرز› ۲. سووک و چرووک؛ بێعار؛ بێ حەشر و نەشر ‹آدم پنتی: مرۆی سووک و چرووک›.

**پنج**[1] / panc/: اسم. پێنج؛ پەنج؛ ژمارەی دوای چوار و بەر لە شەش ‹رسیدیم به عدد پنج: گەییشتینە ژمارەی پێنج›.

**پنج**[2]: صفت. پێنج: ۱. یەکێ زۆرتر لە چوار دانە ‹پنج مرد: پێنج پیاو؛ پنج کتاب: پێنج کتێب› ۲. پێنجم؛ پێنجەم ‹طبقه‌ی پنج: نهۆمی پێنج›.

**پنج ـ**[3]: پیشوازه. پەنجـ ؛ پێنجـ ؛ خاوەنی پێنج دانە لە شتێک ‹پنج‌پهلو: پێنج‌پاڵوو›.

**پنج‌انگشت** / pancangošt، ـها/: اسم. ۱. گیاپەنجە؛ پاقلانچکە؛ گیایەکە لێوارەی گەڵاکانی برکە ـ برکەیە و گوڵەکانی سپی و زەردن ۲. دارئاڵەت؛ بنچکێ کە چێوی سەختی هەیە و میوەکەی بۆنی بیبار دەدا: **دل‌آشوب؛ فلفل بَرّی**

**پنجاه**[1] / pancāh/: اسم. پەنجا؛ پێنجی؛ ژمارەی دوای چل و نۆ و بەر لە پەنجا و یەک.

**پنجاه**[2]: صفت. پەنجا: ۱. پەنجا؛ دانەیەک زۆرتر لە چل‌ونۆ ۲. پەنجایەمین؛ پەنجاهەم؛ پەنجایەم.

**پنجاهم** / pancāhom/: صفت. پەنجایەم؛ پەنجاهەم؛ بە ڕیز و پلەی پەنجاوە.

**پنجاهمی** / pancāhomî/: ضمیر. پەنجایەمی؛ پەنجاهەمی؛ ئەوەی کە لە ڕیز و پلەی پەنجاهەمدایە.

**پنجاهمین** / pancāhomîn/: صفت. پەنجاهەم؛ پەنجاهەمین؛ بە ڕیز، پلە یان جێگەی پەنجاوە.

**پنج‌بر** / pancbar، ـها/: اسم. پەنجپاڵۆ؛

بیچمی بەسراوی هەندسی کە پێنج پاڵ و پێنج سووچی هەیە: **پنج‌ضلعی**

**پنج پر** / pancpar/: *صفت*. پێنج‌پەڕ؛ بە پێنج لق یا پێنج قۆرتەوە ‹ستاره پنج‌پر: هەسارەی پێنج‌پەڕ›.

**پنجدری** / pancdarî، ـها/: *اسم*. پەنجدەری؛ هۆدەیەکی هەراو لە خانوبەرە کۆنەکاندا، بە پێنج دەلاقەی دووتاییەوە.

**پنجره** / pancere, pancare، ـها/: *اسم*. ستادی؛ ساتی؛ سباک؛ تەشاوی؛ دەروەچە؛ دووەری؛ شەباکە؛ وەنەدیک؛ نما؛ پەنجێرە؛ پەنجەرە: ١. چوارچێوەیەک بۆ رووناکی و گۆڕانی هەوا لە دیواری ماڵدا ٢. دەلاقە؛ شووشە؛ شیشە؛ چوارچێوەی شیشە تێخراوی ماشێن و فڕۆکە و گەمیە و ... بۆ رۆشنایی.

▣ پنجرەی زیر سقف: دەلاقە؛ ستاتی‌چکۆلە؛ هەواکێش.

پنجرەی سقفی: کونارۆچن؛ کونەرۆچنە؛ کلاورۆچن؛ کونارۆشن؛ بانجە؛ کوناوج؛ کوناوەجگە؛ کوناوەجە؛ کوناوچە؛ کولاوکە؛ دەلاقەیێک لە سەرمیچی ماڵەوە بۆ رووناکی و گەلێک جار بۆ هاتوچووی هەوا.

**پنجشنبه** / pancšambe, pancšanbe، ـها/: *اسم*. پێنجشەمۆ؛ پەنجشەمە؛ رۆژی دوای چوارشەمبە و پێش جومعە.

**پنجشنبه‌شب** / pancšambešab, pancšanbe-، ـها/: *اسم*. پێنجشەمەشەو؛ پەنجشەمەشەو؛ شەوی هەینی؛ شەوی بەر لە رۆژی هەینی.

**پنج‌ضلعی** / panczel'î/: [فارسی/ عربی] ☜ **پنج‌بَر**

**پنجگاه** / pancgāh/ ☜ **راست‌پنجگاه**

**پنجم** / pancom/: *صفت*. پێنجم؛ پەنجەم؛ یەکێ دوای چوارەم؛ بە ریز، پلە یان جێگەی پێنجەوە.

**پنجمی** / pancomî، ـها/: *ضمیر*. پێنجەمی؛ پەنجەمی؛ ئەوەی لە ریز و جێگەی پێنجەمدایە.

**پنجمین** / pancomîn/: *صفت*. پێنجەمین؛ پەنجەمین؛ پێنج‌هەمین.

**پنج‌وجهی** / pancvachî، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم*. پێنج‌پاڵوو؛ بیچمێک بە پێنج پالووەوە.

**پنجول** / pancûl، ـها/: *اسم*. *[گفتاری]* پەنجە؛ چنچرووک؛ چنجرووک؛ چرنووک؛ پینگۆل؛ چنج؛ چنگاڵ؛ چنگ؛ چنگۆلە؛ چنگەل؛ چرنۆک؛ چنگلێ؛ چونگلێ؛ پەنجەی دەست.

▣ پنجول کشیدن: چنگ‌کێران؛ چنگووڕ گرتن؛ بە نینۆکی ئەنگوستان شتێ کراندن؛ چنگەماڵ‌کەردەی؛ چنگلێ کێشەی.

**پنجه** / pance، ـها/: *اسم*. ١. ناولەپ؛ ناولەواس ٢. پەنجە؛ پەنجێ؛ شوێنی دەس و پا، یان ئەوەی بە شێوەی دەست و پایە.

▣ پنجه کشیدن: ١. دەست پێدا هێنان؛ دەست پێدا کێشان؛ دەس پیا هاوردن ٢. چرنووک‌گرتن؛ چنگ‌گرتن؛ چنگوور گرتن.

**پنجه‌ای** / pance'î/: *صفت*. پەنجەیی؛ لە بیچمی پەنجە ‹برگ پنجه‌ای: گەڵای پەنجەیی›.

**پنجه‌بکس** / panceboks، ـها/: [فارسی/ فرانسوی] *اسم*. پەنجەبوکس؛ بۆگزە.

**پنجه‌رو** / pancerow، ـها؛ ـان/: *صفت*. *[زیست‌شناسی]* پەنجەرۆ؛ سەرپەنجەرۆ؛ تایبەتمەندی گیانداری کە بە سەر پەنجەوە دەڕوا.

**پنج‌هزاری** / panchezārî, panczārî، ـها/:

*اسم.* پەنجقەرانی؛ پارەیەکی کانزایی ئێرانی (نیوەی تمەنێک) کە ئێستا باوی نەماوە.

**پنچر** / pančar/: [از انگلیسی] *صفت.* پەنچەر؛ تایبەتمەندی تەگەرەی کون تێ‌بووگ (لە لاستیکی تەگەرە و...) ‹ماشینمان در راه دوبار پنچر شد: لە ڕێگادا دووجار ماشێنەکەمان پەنچەر بوو›.

**پنچرگیر** / pančargîr، ـها؛ ـان/: [از انگلیسی/ فارسی] *اسم.* پەنچەرگر؛ ئەو کەسەی کە کاری، گرتنی پەنچەری تەگەرەیە.

**پنچرگیری** / pančargîrî، ـها/: [از انگلیسی/ فارسی] *اسم.* پەنچەرگری؛ پەنچەرگیری.

**پنچری** / pančarî/: [از انگلیسی] *اسم.* ١. پەنچەری ‹تا پنچری لاستیک را نگیرم نمی‌روم: تا پەنچەری تەگەرەکە نەگرم، ناچم› ٢. پەنچەرگیری ‹مغازەی پنچری: کارگەی پەنچەرگیری›.

**پند** / pand، ـها/: *اسم. [ادبی]* ئامۆژگاری؛ ئامۆژیاری؛ ئامۆژاری؛ مۆژیاری؛ مۆژگاری؛ مۆچیاری؛ کەت؛ پەند؛ کەلەمە؛ کردە یان وتەی ڕێنوێنی.

▣ **پند دادن:** ئامۆژگاری کردن؛ مۆژیاری کردن؛ مۆچیاری‌دان ‹آن پیر خردمند مرا پند داد: ئەو پیرە زانایە مۆژیاری کردم›.

**پند گرفتن:** پەند وەرگرتن؛ لە گوێ گرتن؛ قسە هەڵگرتن ‹باید از تاریخ پند بگیریم: دەبێ لە مێژوو پەند وەرگرین›.

**پندار** / pendār، ـها/: *اسم. [ادبی]* ١. هزر؛ وێنەی زەینی لە شتێ کە لە ژێر کارتێکردوویی هەستدا نیە ٢. گومان؛ خەیاڵ؛ داوەری یان باوەڕی کەسێک لە بارەی شت یان دیاردەیەکەوە، بەرلەوەی ئازمابێتی ٣. وەهم؛ بیر و هزرێک کە لەگەڵ ڕووداوەکانی جیهانی دەرەوەدا، یەک ناگرنەوە ❊ **پنداشت**

**پنداری** / pendārî/: *صفت.* خەیالی: ١. سەر بە بیر و گومانەوە ٢. ناڕاستەقینەیی.

**پنداری** / pendārî/: *قید. [ادبی]* وەک بێژی؛ وەک شتێ؛ دەڵێی؛ وەک ئەمە؛ وەک ئەمەبوو؛ ئەیژیتە؛ هەر ئێژی؛ گوایا؛ گاوا؛ هەروەک؛ ئەجۆ؛ تمەز؛ تومەس؛ تمەس؛ چمەس؛ چە ئەمە؛ وات ئەزانی؛ واچێنی؛ دەتگوت؛ وا پیشانی‌ئەدا ‹پنداری تازە از خواب برخاستە بود: وەک دەڵێی تازە لە خەو هەستابوو›.

**پنداشت** / pendāšt/ ☜ **پندار**

**پنداشتن** / pendāštan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* //**پنداشتی:** واتزانی؛ **می‌پنداری:** وادەزانی؛ **بپندار:** وابزانە// وازانین؛ بیر بردن؛ وادانان؛ ئەجیەی؛ ئەجیای؛ تەنیا بە یارمەتی زەین (و بێ‌لێکۆڵینەوە و تاقی‌کردنەوە) داوەری کردن یان نرخاندن؛ گومان‌کردن. هەروەها: **پنداشتنی**

■ صفت فاعلی: **پندارندە** (ـ)/ صفت مفعولی: **پنداشتە** (وازانراو)/ مصدر منفی: **نَپنداشتن** (وانەزانین)

**پندآموز** / pandāmûz، ـان/: *اسم. [ادبی]* ئامۆژیار؛ ئامۆژگار؛ ئامۆژکار؛ ئامۆجیار؛ پەندئامۆچ؛ مۆچیاری‌کەر؛ پەندەوان؛ پەندێن؛ ئەو کەسەی ئامۆژگاری بە خەڵکی دەدات. هەروەها: **پندآموزی**

**پندآمیز** / pandāmîz/: *صفت.* نەستەق؛ ئامۆچار؛ پەندانە؛ پەندەوانە؛ تێکەڵاو لە گەڵ پەنددا ‹سخن پندآمیز: قسەی پەندئامێز›.

**پندپذیر** / pandpazîr، ـان/: *صفت. [ادبی]* پەندوەگر؛ ئامۆژگیر؛ گوێ‌بەند؛ پەندگر؛ گوێ‌ڕاگر؛ گوێ‌بیست؛ گۆش‌گیر؛ خاوەن توانایی یان ئۆگرەتی بۆ وەرگرتنی ئامۆژگاری و ڕەچاوکردنی: **پندشنو**. هەروەها: **پندپذیری**

**پندشنو** / pandšeno/ ☜ **پندپذیر**

**پندنامه** / pandnāme، ـها/:/اسم. پەندنامە؛ پەرتووک یان نووسراوەیەک کە پەند و ئامۆژگاری تێدا خڕکراوەتەوە.

**پندنیوش** / pandniyûš، ـان/: صفت. [ادبی] گوێبیس؛ گۆشدەر؛ پەندژنەو.

**پندیات** / pandîyyāt/: (!) [فارسی به قاعدەی عربی]/اسم. پەندان؛ پەندیێ؛ قسەی نەستەق.

**پنس** / pans، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ۱. پەنسە؛ کەلبەتان؛ ساسۆن ۲. گیرە.

▣ پنس جراحی: گیرەی برینکاری.

پنس کاغذ: گیرەی کاغەز.

**پنس** / pens/: [فرانسوی] جمعِ ☜ **پنی**

**پنسیلوانین** / pensîlvāniyan/: [؟]/اسم. پینسیلوانین؛ شەشەم دەورە لە دەورانی یەکەمی زەوی‌ناسی.

**پنط** / pont/: [انگلیسی] ☜ **پُنت**

**پنکه** / panke، ـها/: [هندی]/اسم. پەنکە؛ پانکە؛ باوەشێن؛ بافڕنەک؛ واژەن؛ ئامرازی بەرقی بۆ فێنک‌کردنەوە.

▣ پنکەی سقفی: پەنکەی میچی.

**پنگان** / pangān/:/اسم. ۱. ☜ ساعت آبی، **ساعت** ۲. ☜ ساعت شنی، **ساعت** ۳. ☜ **فنجان-۳**

**پنگوئن** / pango'an، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پەنگۆوەن؛ چەشنێک پەلەوەری ناوچەی ساردی جەمسەری باشووری زەوین.

**پنوماتیک**[1] / penomātîk/: [فرانسوی]/اسم. پێنۆماتیک؛ لقێ لە زانستی مکانیک کە لە چۆناوچۆنی گازەکان دەکۆڵێتەوە.

**پنوماتیک**[2] ☜ **پنوماتیکی**

**پنوماتیکی** / penomātîkî/: [فرانسوی] صفت. پێنۆماتیکی؛ پێنۆماتیک: **پنوماتیک**

**پنهان** / penhān/: صفت. شاراوە؛ پێوار؛ نادیار؛ نەدیار؛ پەنام؛ پەنهان؛ وەشارتی؛ تۆم؛ سەربەسە؛ سەربەستە؛ کیس؛ بەرپیوار؛ فاری؛ پەنامەک؛ نهێن؛ هشار؛ هەشار؛ حەشار؛ حەشاری؛ پۆشراو؛ پەنا؛ سەخت؛ شیش؛ وەشێر؛ شار ‹جای پنهان؛ کار پنهان: شوێنی پیوار؛ کاری نادیار›.

▣ پنهان شدن: خۆ شاردنەوە؛ خۆ وەشارتن؛ خۆ گومکردن؛ خۆ ونکردن؛ خۆ پەنادان؛ ڤەشەمڕان؛ خۆ حەشاردان؛ رووگرتن؛ قایم بوون؛ پەنام‌گێرتەی ‹پس از فرار از زندان مدتی پنهان شد: دوای هەلاتن لە بەندیخانەدا ماوەیەک خوی شاردەوە›.

پنهان کردن: شاردنەوە؛ شیش‌کردن؛ وەشارتن؛ وەدایەنە؛ ڤەراکرن؛ وەشاردن؛ ڤەشارتن؛ ئاشاردن؛ هەشاردن؛ شاراندن؛ شێڕاندن؛ کیساندن؛ تاقەت‌کردن؛ ڤەسماندن؛ شێرانەوە؛ نخفتن؛ داپۆشین؛ نومتش؛ قایم‌کردن؛ پۆشین؛ پۆشان؛ ئاوا کردن؛ نەپەندن؛ هەلانین؛ وەشێردان؛ شارایەوە؛ ئەوەشارەی؛ سەخت‌کەردەی؛ هەشاردان ‹پولها را توی باغچه پنهان کرد: پوولەکانی لە ناو باخچەکە شاردەوە›.

هەروەها: **پنهان بودن؛ پنهان داشتن؛ پنهان‌گشتن؛ پنهان ماندن**

**پنهانکار** / penhānkār، ـها؛ ـان/: صفت. نهێنی‌کار؛ چێرکار؛ ئاو ژێرکا؛ خاوەن ئاکاری پەنامەکی ‹مردی بی سروصدا و پنهان‌کار است: پیاوێکی بێدەنگ و نهێنی‌کارە›.

**پنهانکاری** / penhānkārî، ـها؛ ـان/:/اسم. نهێنکاری؛ دۆخ یا چونیەتی کارکردن بە دوور لە چاوی خەلک ‹شیوەهای گوناگون پنهانکاری به آنان آموزش داده می‌شود: شێوازە جۆراوجۆرەکانی نهێنی‌کاری فێر دەکرێن›.

**پنهانی**[1] / penhānî/: صفت. نهێنی؛ پەنامەکی؛ دزەکی؛ شاردراوە؛ ڤەشارتی؛ وەشێرا؛ شاریاوە ‹عشق پنهانی: ئەوینی

نهێنی›.

**پنهانی** ٢: *قید.* بەدزیەوە؛ پەنامەکی؛ لە ژێرەوە؛ چێرەنە؛ بە نهێنی؛ دزەکی ‹پنهانی با او قرار گذاشت: پەنامەکی لەگەڵیدا کەین و بەینی بەست›.

**پنی** / penî/: [انگلیسی]*اسم.* پێنی؛ وردەی پوند (پارەی ئینگلیس، ئیرلەند و بڕێک وڵاتانی‌تر).

**پنیر** / panîr، ـها/: *اسم.* پەنیر؛ پەنێر؛ پەنێرە؛ تڵ؛ پێخۆری برای ماست.

**پنیرک** / panîrak، ـها/: *اسم.* پەیکە؛ تۆڵک؛ چێچێ؛ قەرەتوورە؛ نانکێ؛ چوچکا؛ نانەحاجیلە؛ نانکی‌چویکا؛ تۆرەکە؛ نانی‌حاجی؛ لەگلەگ؛ نانێ‌چووچک؛ نانێ‌چوک؛ نانێ‌مێچکا؛ پەپەچەور؛ پەپکەچەور؛ پەپکەمەلیچک؛ کولێرەچەورە؛ تولە؛ تولیە؛ تۆڵەکە؛ تۆڵکە؛ تۆڵەکێ؛ پەنێرە؛ پەنیرە؛ پەپکە مەلیچکانە؛ پامەلووچکانە؛ گیانانەشان؛ پەنێرۆکە؛ نان‌حاجی‌لەق‌لەق؛ گیایەکی یەکسالانە، بتێکی سپی گۆشتن و لەقێکی ڕاست و لووس و گەڵای پەنجەئاسای هەیە، بە گوڵی سپی ئاماڵ بەنەوشەوە.

**پنیرمایه** / panîrmâye/: *اسم.* فریشک؛ شیلاوک؛ ژیلاوک؛ ڕیتکە؛ هەوێن؛ هوشە؛ ئامێژە؛ ئامێژەن؛ ئامیان؛ شیلاوقە؛ ئامیانی پەنیر.

**پنی‌سیلیوم** / penîsîlyom/: [؟] ☜ کپک سبز، **کَپک**

**پوار** / pûvār, povār، ـها/: [؟]*اسم.* *[پزشکی]* ئابدۆزەک؛ ئاودۆزەک؛ شریقە؛ فیچقە؛ فیشقە؛ ئامرازێکی دەرزی ئاسا کە دەرمانی پێ لە لەش دەکەن.

**پوئم‌سمفنی** / po'emsamfonî, -sanfonî، ـها/: [؟]*اسم.* *[موسیقی]* سەمفونی؛ جۆرێک مووسیقای وەک بەیت و باوی کوردی.

**پوئیدن** / pû'îdan/ ☜ **پوییدن**

**پوپک** / pûpak، ـها؛ ـان/: *اسم.* *[ادبی]* پەپوو؛ پەپووک؛ پەپووکە؛ پەپوو سلێمانە؛ پەپوو سێمانە؛ پەپوو سلێمانکە.

**پوپلین** / puplîn, poplîn/: [؟]*اسم.* *[قدیمی]* پۆپلین؛ جۆرێ قوماشی تەنک و بێنەخشە زۆرتر لە بەنی پەموو چێ دەکرێ.

**پوت** / pût/: [روسی]*اسم.* *[قدیمی]* پووت؛ تەنەکە؛ یەکەی کێشانە بەرامبەر بە ١٦ کیلۆ: **پوط**

**پوتین** / pûtîn، ـها/: [از فرانسوی]*اسم.* پووتین؛ چزمە؛ جزمە؛ لاپچین؛ پێڵاوی تا قولەقاپە.

**پوچ** / pûč/: *صفت.* پووچ؛ پووچەڵ؛ پوچەڵ؛ بێناوک؛ بێکاکڵ؛ پووک؛ والا؛ هوو: ١. قت؛ هیچ ‹قرعه‌ای که برداشت پوچ بود: ئەو پشکەی هەڵیگرت سوچ بوو› ٢. بێسەرومژ؛ مەحف. بەرانبەر: **پرمغز** ‹حرف پوچ: قسەی پووچ›.

**پوچی** / pûčî/: *اسم.* پووچەڵی؛ پووچی؛ قتی؛ بێناوەرۆکی؛ دۆخ یا چۆنیەتی بێناوەرۆک بوون ‹از پوچی زندگی خود رنج می‌بُرد: لە پووچەڵی ژیانی وەڕەز بوو›.

**پوخ** / pox/: [ترکی] ☜ **پُخ**

**پود** / pûd، ـها/: *اسم.* پۆ؛ هەڤۆ؛ هەوالی ڕایەڵ ‹تار و پودش ابریشم است: تان و پۆی هەوریشمە›.

**پودر** / pûdr، ـها/: [فرانسوی]*اسم.* پوودر: ١. خۆڵ ئاسا ‹شیشه مثل پودر شد: شیشەکە وەک پوودری لێهات› ٢. بەرهەمی گەردئاسای زیاتر پیشەسازی بۆ دەرمان، خاوێن‌کردنەوە و...

▣ **پودر بچه**: بۆدرەی منداڵ؛ گەردی منداڵ؛ گەردێکە لەشی منداڵی ساوای

پێ دەماڵن، نەسووتێتەوە.

پـودر لباسـشویی: گـەرتـەک؛ پـوودری جـل شۆری.

▣ پـودر شـدن: ورد بـوون؛ هاڕیـان؛ هـورد بوون؛ بوونـە تـۆز؛ ورد و خـاش بـوون؛ بیـەی بووڵە.

پـوده / pûde، ـهـا/: صفت. پـوواو؛ پرتووکـاو؛ پرتووکیـاگ؛ پردووخیـاو؛ دارزاو؛ دارزیـاگ؛ رزیو؛ رزاو؛ لەبەر یەک چووی لەکار کەوتوو.

پـور / pûr، ـان/: اسـم. [ادبـی] کـوڕ؛ پـس؛ منداڵی نێرینە.

پورسـان / pûrsān/: [فرانسوی] اسـم. [مخفـف] دەسکارانە؛ کارانە؛ دەسخۆشانە؛ مزی کار.

پورسـانتاژ / pûrsāntāj، ـهـا/: [فرانسوی] اسم. دەسـکارانە؛ مـزی کـار ‹در ایـن معاملـه پورسـانتاژ خـوبی گـرفتیم: لـەم مامـەڵـەدا دەسـکارانەیـەکـی باشمان وەرگرت›.

پورمـک / pûrmak/: اسـم. ١. پـەتـرۆک؛ پـەترۆمـە؛ پـەترۆکـە؛ پـەترۆخـە؛ پـەتـرۆ؛ قـەتماخـە؛ قرتماغـە؛ تۆیـەکی ناسـک کـە لـە سـەرەتـای چـا بوونـەوەی برینـدا لـێ پـەیـدا دەبـێ ‹زخـم دستم پورمـک بسته: زامـی دەسـتم پـەترۆکـی هێنـاوە› ٢. کـەڕوو؛ کـەڕەکیفـە؛ برش؛ کـەڕۆڵـیە ‹ایـن پنیـر کـه پورمـک زده: ئـەم پەنیرە خۆ کەڕووی هێناوە›.

پورنوگرافی / pornog(e)rāfî/: [فرانسوی] ☜ هەرزەنگاری ـ٢

پـوره / pûre، ـهـا/: اسم. ١. پرگـە؛ پـوورە؛ بەچـک؛ شـڵخە؛ پـرگ؛ گـەرای مێـشەواڵـە ٢. پـوورە؛ وردکـراو و کـوتراوی سـێفەزەمـینی و دانـەوێـڵـەی کـوڵاو ٣. پێخـۆرێ کـە لـە کـوتراوەی نـۆک، باقلـە، نیـسک و بـەتایبـەت سـێفزەمینـە و کـەرە یـان ڕۆن و جـار و بارەش هێلکە دروستی دەکەن.

▣ پورەی ملخ: بەچەکولە؛ پوورە کولۆ.

پورەکن / pûrekon، ـها/: اسم. ڕەندە؛ ڕەنە.

پوز / pûz/ ☜ پوزه

پوزبند / pûzband/ ☜ پوزەبند

پوزخنـد / pûzxand، ـهـا/: اسم. زەردەخـەنـە؛ بزەخـەنـە؛ گـورمز؛ پێکـەنینێـک بـە نیـشانەی تیز پێ‌کردن کـە تـەنیـا لێـو دەبـزوێن ‹همـەی دشنامها را با پوزخنـد پاسخ داد: هـەمـوو جنێـوەکـانی بە زەردەخەنە وەرام داوە›.

پـوزش / pûzeš، ـهـا/: اسم. [ادبی] لێبووردانـە؛ ئاکارێـک بـۆ نیـشاندانی پـەژیـوانی و داوای لێبووردن.

▣ پـوزش خواسـتن: داوای لێبـووردن کـردن ‹به خاطر اتفاق دیـروز، پـوزش مـی‌خـواهم: لـە بـەر ڕووداوی دوێنێ داوای لێبووردن دەکەم›.

پوزشـخواهی / pûzešxāhî، ـهـا/: اسم. کـار یـان ڕەوتی داوا کـردنی لێبـووردن ‹بـرای پوزشـخواهی بـه خانـه‌اش رفـت: بـۆ داوای لێبـووردن چووە ماڵی›.

پوزشـنامه / pûzešnāme، ـهـا/: اسم. لێبووردنامە؛ نووسراوە بۆ داوای لێبووردن.

پـوزه / pûze، ـهـا/: اسم. قـەپـۆز؛ قـەپـۆس؛ قـەپۆسـە؛ لمبـۆز؛ لمـۆز؛ لمـووز؛ لـەمبـووز؛ لەمووز؛ لـەمـۆز؛ پـۆز؛ پتوپـووز؛ لـچ و لێـو؛ دەم و پـووز؛ دەم و کـەپـۆی حـەیـوان * پـوز؛ لک‌پوزه

▣ پوزەی کسی را بـه خـاک مالیـدن: [مجـازی] کـەسـێک تـرۆکردن؛ کـەسـێک زەبـوون و ڕووشـکێن کـردن؛ سـەر بـە کـەسـێک داخـستن؛ ڕوو بـە کـەسـێک نـەهێشتن؛ پـشتی کـەسـێک خـەوانـدن ‹مردم عاقبـت پـوزەی زورگویـان را بـه خـاک مالیدنـد: خـەڵـک ئاخری زۆربێژەکانیان ترۆکرد›.

پـوزەبنـد / pûzeband، ـها/: اسم. دەمبـەس؛ دەمـووەس؛ دەمبـێن؛ دەمـبین؛ دەوبـێن؛ دەمبـەسـت؛ قـەمتـەر؛ بزمـەک؛ نرمـک؛

بزموک؛ زاربنک؛ زاربەست؛ لوقمە؛ زاربێن؛ بزمک؛ ئامرازێکە بۆ بەستنی دەمی چوارپێ، بە مەبەستی بەرگری لە گازگرتن یان شت خواردنی.

**پوزیسیون** / pozîsyon /: [فرانسوی]/اسم. ١. دۆخ؛ بار؛ دەق ٢. *[نامتداول]* هەل و مەرج؛ جێگە و ڕێگە.

**پوساندن** / pûsāndan /: مصدر. متعدی. //**پوساندی**: داترزاند؛ **می‌پوسانی**: دادەڕزێنی؛ **بپوسان**: داڕزێنە// داڕزاندن؛ داڕزانن؛ پرتووکاندن؛ پواندن؛ ڕزاندن؛ پوونەی؛ پوونای ‹برگها و علفهای هرز را می‌پوسانند: گژوگیا هەرزەکان دادەڕزێنن›. هەروەها: **پوساندنی**

■ صفت فاعلی: **پوساننده** (داڕزێنەر)/ صفت مفعولی: **پوسانده** (داڕزێنراو)/ مصدر منفی: **نپوساندن** (دانەڕزاندن)

**پوساننده** / pûsānande /: صفت. داڕزێنەر؛ پرتووکێنەر؛ بە تایبەتمەندی و توانایی داڕزاندنەوە.

**پوست**[1] / pûst / ـها/: اسم. پێست؛ پێس؛ پۆس؛ پۆست؛ پووس؛ پویست: ١. مرت؛ قولاخ؛ تۆک؛ تۆخ؛ کەول؛ کەڤل؛ کەوڕ؛ دۆلگ؛ دەرەکی‌ترین بەشی جەستەی مرۆڤ و گیانداران ‹پوست دست؛ پوست گوسفند: پێستی دەست؛ کەولی مەڕ› ٢. تویکڵ؛ تۆکڵ؛ تۆخڵ؛ تێخۆڵ؛ تۆک؛ تۆخ؛ تۆشڵ؛ دەرەکی‌ترین بەشی ڕوەک ‹پوست درخت؛ پوست خیار: تویکڵی دار؛ پێستی خەیار› ٣. تۆکڵ؛ بەشی دەرەوەی هێلکەی گیانەوەران و ناوکەی ڕوەکان ‹پوست تخم‌مرغ؛ پوست گردو: تویکڵی هێلکە؛ تویکڵی گوێز›.

⊡ **پوست از سر کسی کندن**: *[کنایی]* کەولی کەسێک‌کردن؛ پێست کەسێ‌کەندن؛ پۆس سەر کەسێ هاوردنە مل چاوا؛ کەسێک زۆر ئازار جەزرەبەدان.

**پوست انداختن**: ١. پێست هەڵخستن؛ پۆس خستن؛ پۆس دانەوە؛ پۆس هۆرئامەی؛ پۆس مالیایەرە ‹از بس زمین کندم، دستهایم پوست انداخت: ئەمەندە زەویم کەند، دەستم پێستی هەڵخست› ٢. کاژ خستن؛ کراژ خستن؛ پێستدانەوەی وەرزی مار و مێرووله.

**پوست چیزی را کندن**: پێستی شتێک گرتنەوە؛ تۆکڵ چتێ گرتنەوە؛ پاک کردن؛ پاخلێرکردنی شتێک؛ چتێک پاقلیرکردن؛ پۆسوو چێویە کەنای؛ پێست لە شتێک‌کردنەوە ‹پوستش را بکن بخور، خیلی خوشمزه است: تویکڵی بکەرەوە و بیخۆ، زۆر خۆشە›.

**پوست خربزه زیر پای کسی گذاشتن**: *[کنایی]* ساون خستنە بەرپێی کەسێکەوە؛ ساون دان لە ژێرپای کەسێک؛ پیلان گێڕان بۆ کەسێک بە پێیدا هەڵگوتن و لەخۆ بایی‌کردنی ‹مواظب باش! با این بلەقربان گفتن‌ها، دارند پوست خربزه زیر پایت می‌گذارند: وریا بە! بەم بەڵێ قوربان گوتنانەوە، خەریکن ساون نەخەنە بەرپێت›.

**پوست کردن**: *[گفتاری]* پاک‌کردن؛ پاخلێر کردن؛ قەشارتن؛ توخڵ گرتنەوە (زۆرتر بۆ خواردەمەنی) ‹خیار پوست کند: خەیار پاک کەن›.

**پوست کسی را کندن**: *[کنایی]* کەولی کەسێک‌کردن؛ کەسێ گرژاندن؛ پۆس کەسێ گرتنەوە؛ چەرمی کەسێک دەق دان؛ ناوکی کەسێک‌گرتنەوە؛ کەسێک زۆر ئەزیەت دان.

**پوست کسی کنده شدن**: *[کنایی]* تویخ چوون؛ تووش تەشقەڵە بوون؛ پێست لە

کەسێک داماڵیان.

در پوست خود نگنجیدن ☜ **در**[۲]

**پوست**: صفت. [گفتاری] پێستینە؛ پۆسی؛ پۆسین؛ دروستکراو لە پێست و کەوڵی گیانەوەران ‹پالتو پوستی؛ کُلاه پوستی: باڵتە پێستینە؛ کڵاو پێستینە›.

**پوستاکان** / pûstākan, -'ākan/، ها؛ ان/: اسم. پێستەخۆشکەر؛ وشککەرەوەی پێستی پەلەوەر و گیانلەبەر.

**پوستاکانی** / pûstākanî, -'ākanî/، ها/: اسم. کاری وشکەوکردن؛ وشککردن؛ پێستە خۆشکەری.

**پوست‌اندازی** / pest'andāzî/: اسم. کاژ خستن؛ پۆس‌دانەوە؛ پۆس وستەی؛ ڕەوتێک لە گەورەبوونی مێشەواڵە و خزۆکان کە پێستی تازە شین دەکەن و لە پێستی کۆنە دەبنەوە.

**پوست‌پلنگی** / pûstpalangî/: صفت. پۆس‌پڵ ـ پلی؛ پێست خاڵ ـ خاڵی.

**پوست‌پیازی** / pûst(e)piyāzî/: صفت. ۱. هەزارتوێ؛ توێ‌ـتوێ‌لە سەر یەک ۲. ناسک؛ بە پێستی ناسک و کەم هەڵکردەوە ۳. ڕەنگی پیاز؛ وەک ڕەنگی زەردی مەیلەو سوور؛ زەردی ئاماڵ ئاڵ.

**پوست‌تخت** / pûst.taxt/، ها/: اسم. تەختە پێس؛ کەولی پایەناز؛ تەختەکەولی پەز یان بزن کە وەک فەرش داخراوە.

**پوست‌خرکن** / pûst(e)xarkan/، ها/: صفت. [کنایی] پۆس‌تس‌گرەوە؛ گوو وشکەوکەر؛ چاوچنۆک؛ ڕژد؛ گەنووس؛ چەڵماس.

**پوستر** / poster/: [انگلیسی] ☜ **پُستر**

**پوستک** / pûstak/، ها/: اسم. قاشک؛ توێی سەر برێک ئەندامانی گیا بۆ پاراستنی.

**پوست‌کرده** / pûstkarde/، ها/: صفت. پێست‌گیراو؛ تۆک‌گیراو؛ پاک‌کریاگ؛ تۆکەو گیریاگ؛ پێس‌گیریاو؛ پاک‌کراو؛ پۆستکەندە ‹سیب‌زمینی پوست‌کرده: سێفەزەمینی پێست‌گیراو›.

**پوست‌کلفت** / pûstkoloft/، ها/: صفت. ۱. پێست‌ئەستوور؛ تۆکڵ قایم ‹هندوانه پوست‌کلفت: شووتی پێست ئەستوور› ۲. [مجازی] پۆس‌کولفت؛ پێست قایم؛ پێس قەوی؛ مل ئەستوور؛ گێپەڕ؛ خاوەن تاقەت و توانی زۆر (بە تایبەت لە بەرامبەر زەبر و ئازار و تێکۆشاندا) ‹خیلی پوست‌کلفت است، تحملش را دارد: فرە پۆس‌کولفتنە، تاقەت تیرێ›. هەروەها: **پوست‌کلفتی**

**پوستکن** / pûstkan/، ها/: اسم. کەولکەر؛ کورێن؛ کەولگیر؛ تووک‌گیر؛ کەسێ کە پێست لە ماڵات دادەڕنێ

**پوستکن** / pûstkon/، ها/: اسم. تۆکەوگیر؛ تویکڵ‌گر؛ پۆس‌کەن؛ تۆکڵ‌گیر؛ ئامرازێک بۆ گرتنەوەی تویکڵی میوە و سەوزی (وەک سێفەزەمینە و کوولەکە و خەیار و سێف): **پوستگیر**

**پوست‌کنده**[۱] / pûstkande/: صفت. پۆسکەندە: ۱. تویکڵ‌گیراو؛ پۆس‌گیریاو؛ تۆکەوگیریاگ؛ تۆکڵ‌گیراو ۲. [کنایی] ڕووت و ڕاس؛ ڕەپ؛ ڕەپاوڕەپ؛ ڕاس‌ـڕاس؛ پەتی؛ ڕاشکاو و بێ‌پەردە ‹حرف پوست‌کنده: قسەی ڕووت و ڕاس›.

**پوست‌کنده**[۲]: قید. ڕەپ و ڕاست؛ ڕەپ؛ ڕەپاوڕەپ؛ بە ڕاس و ڕووتی؛ ڕاست و ڕەوان؛ بێ مسەمس؛ بە کوردی و کورتی ‹پوست‌کنده بگو نمی‌دهم: ڕەپ و ڕاست بێژە نایدەم›.

**پوست‌گردوئی** / pûst(e)gerdû'î/ ☜ **پوست‌گردویی**

**پوست‌گردویی**[۱] / pûst(e)gerdûyî/: اسم.

کەمکۆلی؛ ڕەنگی وەک پێستی گوێزەتەڕە؛ سەوزی تێکەڵ بە زەرد و ڕەش: **پوستگردوئی**

**پوستگردویی** [2]: *صفت.* کەمکۆلی؛ بە ڕەنگی وەک پێستی کاردۆژە: **پوستگردوئی**

**پوستگیر** / pûstgîr/ ☜ **پوستکَن**

**پوستماری** / pûstmārî/: *صفت.* کەڤلەماری؛ لە بیچم و شکڵی پێستی مار.

**پوستواستخوان**/ pûst-o-ostexān, -ostoxān/: *صفت. [کنایی]* پێست و پێشە؛ مەڕەمووکە؛ گەجەر؛ داڵگۆشت؛ چۆکلینە؛ زۆر لەڕ و لاواز ‹وقتی از سربازی برگشت، یک پارچه پوست و استخوان بود: کە لە سەربازی هاتەوە هەر پێست و بینەیەک بوو›.

**پوسته** / pûste، ـها/: *اسم.* توێکڵ؛ تۆکڵ؛ تێکول؛ تیکۆل؛ تێخول؛ تۆخڵ؛ تیقڵ؛ قاپێلک؛ قەپێلک؛ قاپۆڕ؛ قاشل؛ کێلوودە؛ کەواخە.

◙ **پوستەی زمین**: تێکولی زەوین؛ دەرەکی‌ترین بەشی زەوی.

**پوسته ـ پوسته** / pûstepûste/: *صفت.* تۆ_تۆ؛ توێ_توێ؛ تۆخە_تۆخە؛ تۆژ_تۆژ؛ ڕوویەک کە بە شێوەی پەڕەگەلی چکۆلە و پوولەکەئاسا دەرکەوێت ‹پس از چند روز رنگ دیوار پوسته‌ـپوسته شد: دوای چەند ڕۆژ ڕەنگی دیوارەکە توێ‌ـتوێ بووەوە›.

**پوستی** / pûstî/: *صفت.* ١. پێستی؛ پۆسی؛ سەبارەت بە پێست ‹بیماری پوستی: نەخۆشی پێستی› ٢. پێسین؛ پۆسین؛ درووسکراو لە پێست ‹کاغذ پوستی: کاغەزی پێسین›.

**پوستیش** / postîš/: [از فرانسوی] ☜ **پُستیژ**

**پوستین** / pûstîn، ـها/: *اسم.* کەڵپۆس؛ کەوڵپۆس؛ پۆستین؛ پۆسین؛ فەرەنجی؛ کوورک؛ کەڤل؛ کەوڵ؛ پۆس؛ کەوڵی تیسکن؛ پۆست؛ فەروە؛ پاڵتۆ یان کۆتی لە پێستە مەڕ، بە خوریەکەیەوە.

**پوستین‌دوز** / pûstîndûz، ـها؛ ـان/: *اسم.* کەوڵدۆز؛ کەوڵدوور؛ پۆسیندروو؛ کەڵپۆسوراز. هەروەها: **پوستین‌دوزی؛ پوستین‌فروش؛ پوستین‌فروشی**

**پوسیدگی** / pûsîdegî، ـها/: *اسم.* پوواوی؛ داڕزاوی؛ داڕزیاگی؛ ڕزاوی؛ پۆلکین؛ پرتووکاوی؛ پورتووکاوی؛ پۆرتکاوی؛ پردووکیاوی؛ پرتووکیاگی؛ پردووخیایی؛ لەبەر یەک چوویی ‹پوسیدگی دندان: سوواوی ددان›.

**پوسیدن** / pûsîdan/: *مصدر. لازم.* //**پوسیدی**: داڕزای؛ **میپوسی**: دادەڕزی؛ **بپوس**: داڕزە// داڕزان؛ ڕزیان؛ داڕزیان؛ ڕزان؛ داقنان؛ هەلا بوون؛ پرتووکیان؛ پردووخیان؛ پوان؛ پوویەی؛ پوویای؛ پووسیان؛ پۆسین؛ پۆسیان؛ پەڕتین؛ ڕزین. هەروەها: **پوسیدنی**

■ صفت مفعولی: **پوسیده** (داڕزاو)/ مصدر منفی: **نَپوسیدن** (دانەڕزان)

**پوسیده** / pûsîde، ـها/: *صفت.* داڕزاو؛ پرتووکاو؛ پرتووکیاگ؛ ڕزیو؛ ڕزاو؛ ئەڕاڕزی؛ پۆرتکاو؛ پواو؛ هیمین؛ هەلار؛ هەلا؛ لەبەر یەک چووی ڕزاو ‹دندان پوسیده: ددانی ڕزیو›.

**پوش** [1] / pûš/: *اسم.* ١. *[قدیمی]* چێغ؛ چیغ؛ چیخ؛ دەوار؛ ڕەش‌دەوار؛ خێوەت؛ تاوڵ؛ زۆم؛ ڕەشماڵ؛ سیاماڵ ٢. *[گفتاری]* پرووشە؛ پووشە؛ پووش؛ چڵەکا؛ پار؛ بەشێکی زۆر چکۆلە و ناسک لە شتێک.

◘ **پوش دادن**: گزردان؛ گژکردن؛ قژ هەڵدانەوە؛ فڕ دانە لاوە؛ گژراندن؛ دەژنەی؛ قژ شانەدانی بە پێچەوانە.

ـ **پوش** [2]: *پیواژە.* ـ پۆش ‹طلاپوش: زێڕپۆش›.

**پوشاک** / pûšāk/: *اسم.* پۆشاک؛ جلک؛ چەک؛ شمەک؛ گنج؛ پۆشەن؛ هەنجگ؛ جل و بەرگ.

**پوشال** / pûšāl، ـھا/: *اسم.* تەراش؛ پووشکا؛ پەرووش؛ پەرووشە؛ پووشاڵ؛ پەلەش؛ چیلکا؛ تۆڵاشە؛ تۆڵاش؛ باریکەی چێو، مقەبا، کاغەز یان گژ و گیا.

**پوشالی** / pûšālî/: *صفت.* ١. پووشالی؛ سەر بە پووشاڵ ٢. *[مجازی]* سست؛ شل و شەویق؛ شلەواقە؛ شلویق؛ بێ هەڵکرد و خۆنەگرتوو ٣. *[مجازی]* درۆینە؛ درۆیین؛ دەرەویین؛ فڕ و فیشالی ‹ارتش پوشالی: ئەرتەشی فڕ و فیسانی›.

**پوشاندن** / pûšāndan/: *مصدر. متعدی.* //**پوشاندی**: داتپۆشاند؛ **میپوشانی**: دادەپۆشێنی؛ **بپوشان**: داپۆشێنە// داپۆشاندن؛ پۆشین؛ پۆشان: ١. داپۆشان؛ بان‌دان؛ داشاردن؛ تەڤزاندن؛ پۆژنایرە؛ ئەرەپۆژنەی؛ سەخت‌کەردەی ‹روی چیزی را پوشاندن: بان شتێ داپۆشان› ٢. لە بەر کردن؛ کردنە بەر؛ کردنە پێ؛ کەردەینە ‹کفش پوشیدن: پێلاو کردنە پێ› ٣. *[مجازی]* شاردنەوە؛ حەشاردان؛ داپۆشان؛ ئەرەپۆژنەی ‹برای پوشاندن منظور اصلی‌اش خیلی تلاش می‌کرد: بۆ شاردنەوەی مەبەستی سەرەکی خۆی زۆری حەول دەدا› ٤. داپۆشان؛ گرتنەبەر؛ داگرتن ‹این شبکەی تلویزیونی سراسر جهان را می‌پوشاند: ئەم تۆڕی تەلەفیزیۆنیە سەرانسەری جیهان دەکرێنە بەر›. هەروەها: **پوشاندنی**

■ صفت فاعلی: **پوشاننده** (داپۆشێنەر)/ صفت مفعولی: **پوشانده** (داپۆشێنراو)/ مصدر منفی: **نپوشاندن** (دانەپۆشاندن)

**پوشبرگ** / pûšbarg، ـھا/: *اسم.* پەرەپووش؛ بارپۆش؛ ئەو پەرە ناسکە کە لاسکەی گوڵی داپۆشیوە.

**پوشپر** / pûšpar، ـھا/: *اسم.* وردە تووک؛ وردە پەڕ و کوڵکی بن شاپەڕی باڵندە.

**پوشپرک** / pûšparak، ـھا/: *اسم.* وردە تووکان؛ ڕیشاڵی زۆر باریکی بن شاپەڕی باڵندە.

**پوشت** / pûšet، ـھا/: [فرانسوی]/*اسم.* پووشیت؛ دەسرۆک؛ ئەو دەستماڵەکە بۆ جوانی لە گیرفانی سەرووی لای چەپی کۆتەوە دەری دەخەن.

**پوشرنگ** / pûšrang/: *اسم.* ئەو ڕەنگە کە دەرەوەی شتێک (وەک دیوار یان ماشێن) دادەپۆشێ.

**پوشش** / pûšeš، ـھا/: *اسم.* پۆشەن؛ پۆشەون؛ پۆشش: ١. بەرگ؛ قلێف؛ ئەوەی کە شتێ دادەپۆشێ ‹پوشش روی مبلها را جمع کرد: پۆشەنی سەر موبلەکانی کۆ کردەوە› ٢. جل‌وبەرگ ‹هر دو پوشش مرتبی داشتند: هەردووکیان پۆشەنێکی ڕێک‌وپێکیان هەبوو› ٣. داپۆشەر؛ ئەوەی کە جێگایەک دادەگرێ یان کارتێکەری تێدا هەیە ‹پوشش خبری: پۆشەونی هەواڵی› ٤. *[مجازی]* ژێرناو؛ ئەوەی کە بۆ شاردنەوەی مەبەستێک بە کار دەڕوا ‹عدەای جاسوس را در پوشش یک هیئت بازرگانی به اینجا فرستادند: تاقمێک شۆفاریان لە ژێرناوی شاندێکی بازرگانیدا ڕەوانەی ئێرە کرد› ٥. *[نظامی]* کار و هۆکارێک بۆ پێشگری لە هێرشی دوژمن یان پشتیوانی لە هێزی خۆیی.

◙ پوشش گل ☜ **گلپوش**

◘ پوشش دادن: ١. پۆشتەکردن ٢. *[مجازی]* کار تێکردن ٣. *[مجازی]* پشتیوانی‌کردن ٤. داگرتن؛ گرتنە بەر؛ لەبەرگرتن؛ گرتنە بەر خۆ.

**پوششی** / pûšešî/: *صفت.* ١. پۆشێنەر؛ پۆشەر؛ داپۆشێنەر ‹بافت پوششی: چنراوی پۆشێنەر› ٢. *[کنایی]* پۆشەرانە؛ حەشاردەر؛ سەختکەر؛ تاقەتکەر ‹عملیات پوششی: شەڕی

پوشه‌رانه›.

**پوشک** / pûšak، ـها/: اسم. پۆشکە؛ کۆنە؛ بەرهەمێکی نەرمچنراو بۆ خاوێن هێشتنەوەی منداڵێ کە هێشتا فێر نەبووە بچێتە سەر ئاو ‹بچه را پوشک کن!: منداڵە پوشکە بکە!›.

**پوشن** / pûšan، ـها/: اسم. پۆشەن؛ کاوێر؛ پۆششی شتێک (وەک کتێب، جلوبەرگ و...) ‹پوشن کُت و شلوار: پۆشەنی کۆت و شەڵوار›.

**پوشه** / pûše، ـها/: اسم. پووشە؛ قەمزە؛ بەرگ؛ بەرگی نۆشتە ‹همەی نوشته‌ها را لای پوشه گذاشت: هەموو نووسراوەکانی نیا تۆی پووشەکەوە›.

**-پوشی** / pûšî/: *پیوازه*. ـ پۆشی؛ کار و رەوتی داپۆشین ‹عیب‌پوسی: عەیب‌پوسی›.

**پوشیدگی** / pûšîdegî، ـها/: اسم. پۆشتەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی داپۆشاو بوون ‹پوشیدگی از ویژگیهای فرهنگ ماست: پۆشتەیی لە تایبەتمەندیەکانی فەرهەنگی ئێمەیە›.

**پوشیدن** / pûšîdan/: *مصدر. متعدی.* //**پوشیدی:** پۆشیت؛ **می‌پوشی:** دەپۆشی؛ **بپوش:** بپۆشە// ١. پۆشین؛ پۆشان؛ پوشین؛ پۆشەی: *الف)* لە بەرکردن؛ دە بەرکردن؛ کردنە بەر؛ دە بەر خۆکردن؛ ئەنەکەردەی (کراس و کۆت و...) *ب)* لە پێ‌کردن؛ کردنە پا؛ کەردەینە پای (پانتۆڵ و کەوش و...) *ج)* کردنە دەستەوە؛ کەردەینە دەس ٢. *[مجازی]* داپۆشین؛ نخفتن؛ شاردنەوە؛ وەشاردن؛ رایاندن؛ ئەرەپۆژەی؛ ئەوەشارای ‹راز کسی را پوشیدن: رازی کەسێک داپۆشین›.

هەروەها: **پوشیدنی**

■ صفت فاعلی: **پوشنده** (پۆشەر)/ صفت مفعولی: **پوشیده** (پۆشراو)/ مصدر منفی: **نَپوشیدن** (نەپۆشین)

**پوشیدنی** / pûšîdanî/: *صفت.* پۆشەن؛ پۆشک؛ شیاوی لە بەرکردن.

**پوشیده** / pûšîde/: *صفت.* پۆشراو؛ داپۆشراو؛ داپۆشیاگ: ١. پۆشدار؛ نوخوم؛ سەربەستە؛ سەربەسە؛ سەرسوور ‹دهانەی پوشیده: دەرگەی پوشیده› ٢. *[مجازی]* بەستراو؛ بەرپیوار؛ وەشارتوو؛ نهێنی؛ شاردراوە؛ داشاریاگ؛ شاراوە ‹سخن پوشیده: وتەی پوشیده›.

**پوط** / pût/: [روسی] ☜ **پوت**

**پوف** / pûf/: *صوت.* پیف؛ پف؛ پۆف؛ نیشانەی بێزاری ‹پوف، چه بویی!: پف، لەم بۆیە!›.

**پوک** / pûk، ـها/: *صفت.* پووک؛ پیک؛ پووکەڵ؛ پووچەڵ؛ پووچ؛ قڕاڵ؛ قارپە؛ خالی. بەرانبەر: **پرمغز** ‹گردوی پوک: گوێزی پووچەڵ›.

▣ پوک شدن: پووکانەوە؛ پووکەو بوون؛ هەڵۆڵ/ هەرۆڵ بوونەوە؛ قورۆڵەو بوون؛ پووکیەی ‹تنەی درخت پوک شده است: کۆتەی دارەکە پووکاوە›.

**پوکاندن** / pûkāndan/: *مصدر. متعدی.* *[نامتداول]*// **پوکاندی:** پووکاندت؛ **می‌پوکانی:** دەپووکێنی؛ **بپوکان:** بپووکێنە// پووکاندن؛ پتورکاندن؛ پرتووکاندن؛ دارزاندن؛ لە نێو بردنی بناغە و پتەوی شتێک ‹آب پی ساختمان را پوکانده بود: ئاو بنەڕەتی ماڵەکەی پووکاندبوو›.

■ صفت مفعولی: **پوکانده** (پووکێنراو)/ مصدر منفی: **نَپوکاندن** (نەپووکاندن)

**پوکر** / poker، ـها/: [انگلیسی] اسم. پوکیر؛ یارییەکە بە وەرەق دەکرێ.

**پوکه** / pûke، ـها/: اسم. پووکە؛ قەواخ؛ قەباخ؛ قەباخە؛ قەوان؛ قاپۆڕ؛ قاپۆر؛ قاوڕ؛ قابغ؛ قاوغ؛ قابڵۆخ؛ قاپڵۆخ؛ قەپوو؛ قاقل؛

قالک؛ جێ باررووتی فیشەک ‹از توی خیابان‌ها پوکەی فشنگ جمع می‌کردیم: لە نێو شەقامەکاندا پووکەی فیشەکمان خڕ دەکردەوە›.

**پوکی** / pûkî/: اسم. پووکی؛ پووکاوی؛ هلۆلی؛ ناو بەتاڵی؛ قالایی؛ قالاهی؛ لەدەس دانی کاکڵ و نەمانی پتەوی ‹پوکی استخوان: پووکی پێشە›.

**پول** / pûl، ـها/: [یونانی]/اسم. پارە؛ پووڵ؛ پۆڵ؛ پویل؛ دراو؛ دراڤ؛ جیفە؛ زەڕ: ١. شتی وەرگیراوی گشتی لە وڵاتێکدا بۆ کڕین و فرۆشتنی کاڵا و ڕاژەگەل، کە نرخێکی دیاریکراوی هەیە ٢. بایەخ یان خەرجی شتێک ‹پول اتوبوس: پارەی پاس› ٣. *[مجازی]* شتێ کە بە پووڵ دەگۆڕدرێتەوە ‹این فرش را بخر، همیشه پول است: ئەم قالیە بکڕە، هەمیشە پارەیە›.

◙ **پول پیش**: ١. دەسپێڕ؛ بێعانە ‹این را برایم نگهدار، پول پیش هم می‌دهم: ئەمەم بۆ ڕاگرە، دەسپێڕیش دەدەم› ٢. بارمتە؛ بارۆمتە؛ پارەیەک کە بۆ کرێی خانوو، دووکان و... لە کاتی دانانی بڕیاردا وەریدەگرن و دوای ماوەی بڕیارەکە دەدرێتەوە ‹اجاره‌اش ماهی یکصدهزارتومان است و یک میلیون هم پول پیش می‌خواهد: کرێکەی مانگی سەد هەزار تمەنە و ملیۆنێکیش بارمتەی دەوێ›.

**پول تقلبی**: زڕەدراو؛ پارەی قۆڵابی؛ دراوی قەڵب: **پول قلابی/ قلب**

**پول توجیبی**: پارەی گیرفان؛ دراوی تایبەت بۆ خەرجی ڕۆژانەی هەرکەس ‹پسرم روزی صد تومان پول توجیبی می‌گیرد: کوڕەکەم ڕۆژی سەدتمەن پارەی گیرفان دەگرێ›.

**پول چای**: *[کنایی]* پووڵ چایی؛ دستخۆشانە؛ دەسخوەشانە؛ پارەیەک کە بۆ سپاس لە کاری کرێکارێک پێی دەدرێ ‹پول چای ما فراموش نشود: دستخوشانەکەمان لە بیر نەکەی›.

**پول حرام**: پارەی حەرام؛ دراوی ناڕەوا؛ پارەی پیس. بەرانبەر: **پول حلال**

**پول حلال**: پارەی حەلاڵ؛ دراوی ڕەوا؛ پارەی خاوێن. بەرانبەر: **پول حرام**

**پول خرد**: وردە؛ پووڵەوردە؛ قەرەپووڵ؛ پارەی ورد؛ پووڵی ورد؛ چەرخی؛ خوردە؛ پەرەهەوور؛ زەڕەوردە ‹ببخشید پول خرد ندارم: ببوورن وردەم نیە›.

**پول خون**: پارەی خوێن؛ زەڕوو ونێ؛ خوێن؛ خوێنبایی.

**پول درشت**: زروە؛ پووڵە زروە؛ پووڵە درشتە؛ پووڵە قەویە.

**پول درگردش**: پارەی بەدەستەوە، کە بۆ سەندن و فرۆشتن و جێبەجێ بوونی کاری ئابووری پێویستە.

**پول راکد**: پارەی داکەوتوو؛ ئەو پارەیە کە هیچ کارێکی پێ ناکرێ.

**پول رایج**: پارەی باو؛ ئەو پارەیە کە لە وڵاتێکدا مامەڵەی پێ‌دەکرێ ‹پول رایج اروپا یورو است: پارەی باوی ئورووپا یۆرۆیە›.

**پول زرد**: زێڕ؛ پارەی زەرد؛ سکەی زێڕین؛ پارەی بەقیمەت.

**پول سفید**: زیو؛ پارەی زیو.

**پول سیاه**: پارەی ڕەش؛ قەرەپووڵ؛ پارەی بێ‌قیمەت.

**پول طلا**: دراوی زێڕ؛ سکەیەک کە زێڕی زۆر بێت. هەروەها: **پول نقره**

**پول فلزی**: سکە؛ سکێ؛ پوولک؛ پیلک.

**پول قابل تبدیل**: پارەی بایەخدار؛ ئەو پارە کە بکرێ بە پووڵی وڵاتی‌تر بیگۆڕیەوە.

**پول قلابی/ قلب** ☜ **پول تقلبی**

**پول قلنبه**: *[گفتاری]* پارەیەکی زۆر؛ کۆڵێ پووڵ؛ تاپوورێک پووڵ ‹برای این کار یک پول قلنبه لازم است: بۆ ئەم کاره پارەیەکی زۆر پێویسته›.

**پول کاغذی**: پارەی کاغەزی؛ پووڵ کاغەزینه؛ ئەسکەناس.

**پول نقد**: پارەی نەخت ‹فقط پول نقد قبول می‌کنیم: تەنیا پارەی نەخت وەردەگرین›.

▣ **پول بالای چیزی دادن**: پاره لە سەر شتێک ژماردن؛ پاره بۆ شتێک ژماردن؛ پاره بە شتێک دان؛ پاره لە سەر شتێک دان؛ پارەی زۆر بۆ شتێک خەرج کردن ‹ده هزار تومان بالای این کیف پول دادم: ده هەزار تمەن پارەم لە سەر ئەم کیفە ژماردووه›.

**پول پارو کردن**: *[کنایی]* پاره ماشینەوە؛ زەڕ ئەوەماشتەی؛ خاوەنی دەرامەتی زۆر بوون.

**پول ـ پول شدن**: ورد و خاش بوون؛ ورد ـ ورد بوون؛ ئەنجە ـ ئەنجە بوون؛ خاپوور بوون ‹شیشه پول ـ پول شد: شووشەکە ورد و خاش بوو›.

**پول جمع کردن**: پووڵ کۆکردنەوە؛ پاشەنازکردن؛ پاشکەوت خستن؛ پووڵ نیانه یەکەو؛ پووڵ و پاره خستنەوە ‹پول جمع کن، یک خانه بخر: پووڵ کۆ وەکە، خانوویێک بکڕه›.

**پول خرج کردن**: پاره خەرج کردن ‹هرچه پول داشتی خرج زنت کردی: هەرچی پارەت بوو خەرجی ژنەکەت کرد›.

**پول خود را دور ریختن**: *[کنایی]* پاره تووڕدان؛ پووڵ بە فیڕۆ دان؛ زەڕ فڕە دەی ‹اگر این بارانی را بخری پولت را دور ریخته‌ای: ئەگەر ئەم بارانیە بکڕی پارەکەت تووڕداوه›.

**پول درآمدن**: پاره دەرهاتن؛ پاره بەدەس هاتن ‹از این کار پول درمی‌آید: لەم کاره پاره دەردێت›.

**پول درآوردن**: پاره دەرهێنان؛ پاره بەدەس هاوردن؛ پاره وەدەست هێنان؛ پووڵ دەرهاوردن؛ زەڕ بەرئاردەی ‹از این مغازه پول خوبی در می‌آید: لەم دووکانە پارەیەکی چاک دەردێ›.

**پول کردن** ☜ **به پول نزدیک کردن**

**پول کسی از پارو بالا رفتن**: *[مجازی]* پاره لە کەسێک داکەوتن؛ گەنج کەسێ لە کوناوجەوه چوونه بان؛ پارەی کەسێک لە ڕاده بەدەر چوون ‹بعضی از آقایان پولشان از پارو بالا می‌رود: بڕێ لە ئاغاکان پارەیان لێ دادەکەوێ›.

**پول کسی زیادی کردن**: *[کنایی]* پووڵ بە سەر کەسێکدا ڕژان؛ بە ماڵی خۆ بایەخ نەدان؛ هەمیەت نەدان بە ماڵی خۆ ‹مگر پولم زیادی کرده که خرج این کارها بکنم؟: مەگەر پووڵم بە سەردا ڕژاوه کە خەرجی ئەم کارانەی بکەم؟›.

**به پول نزدیک کردن**: *[کنایی]* کردنە پووڵ؛ فرۆشتن: **پول کردن**

**پولاد** / pûlād/ ☜ **فولاد**

**پولپرست** / pûlparast، ـها؛ ـان/: [یونانی/ فارسی] *صفت*. پووڵپەرست؛ پولپەرست؛ پوولەکی؛ پوولەکی؛ ڕژد؛ دەسقووچاو؛ چرووک؛ چنۆک؛ خەپوولی؛ پاره خۆشەویست؛ زەڕ وەشەویس. هەروەها: **پولدوست**

**پولدار** / pûldār/: [یونانی/ فارسی] *صفت*. *[گفتاری]* دەوڵەمەند؛ دەوڵەمەن؛ خاوەن سامان؛ جادار؛ پارەدار؛ پووڵدار؛ دارا؛ زەنگین؛ پارەمۆڵ؛ بووده ‹چند خواستگار پولدار داشت: چەند داواکاری دەوڵەمەندی هەبوو›.

پولساز / pûlsāz، ـها؛ ـان/: [یونانی/ فارسی] صفت. پووڵئاوەر؛ پارەدەرهێنەر؛ پووڵهێنەر ‹کار و کاسبی پولسازی دارد: کار و کەسبێکی پووڵسازی هەیە›.

پول‌شمار / pûlšomār، ـها/: [یونانی/ فارسی] اسم. پووڵژمێر؛ کەرەسەیەکی کارەبایی بۆ ئەژماردنی خێرای ئەسکەناس.

پولک / pûlak، ـها/: [یونانی/ فارسی]/اسم. ١. [جانورشناسی] پووڵەک؛ پووڵەکە؛ فەلس؛ پەڕەی وردەی پشتی بڕێ لە ماسیان ٢. [خیاطی] پرپرە؛ بریقە؛ ئۆیە؛ ئۆییە؛ پووڵەکە؛ پەڕە وردیلەی ڕەنگاوڕەنگی جلک ڕازێن.

پولک‌دوزی / pûlakdûzî/: [یونانی/ فارسی] اسم. پووڵەکچنی: ١. پووڵەکدووری؛ پووڵەکەچنی؛ هونەر یان زانینی هۆنینەوەی پووڵەکە ٢. /ـها/ هەرچی پووڵەکەی لە سەر هۆنرابێتەوە.

پولکی / pûlakî، ـها/: [یونانی] صفت. [گفتاری] پووڵەکی: ١. پوولی؛ پووڵپەرست ٢. بە شێوەی پووڵەک ‹آبنبات پولکی: مژۆکەی پووڵەکی›.

پول و پله / pûl-o-pale/: [یونانی/ فارسی] اسم. [گفتاری] ماڵ و سامان؛ پووڵ و پارە؛ ماڵ و دارایی؛ پووڵ و دارایی ‹پول و پله‌ای تو دست و بالش نیست: ماڵ و سامانێکی بەدەستەوە نیە›.

پولونیم / polon(i)yom/: [فرانسوی/ انگلیسی] ☜ **پُلونیُم**

پولی / pûlî، ـها/: [انگلیسی]/اسم. پوولی؛ چەرخێ کە هێزی گەڕانی موتور (بە زنجیر یان تەسمە) دەداتە بەشێکی تری کەرستەوە.

پولی: [یونانی] صفت. پوولی؛ پارەیی: ١. سەر بە پووڵ ‹سیاست پولی: سیاسەتی پوولی› ٢. بە پارە؛ بە پووڵ؛ پێویست بە دانی پارە ‹این طور پیش برود، نفس کشیدن هم پولی می‌شود: ئاوا بڕوا، هەناسە دانیش ئەبێتە پوولی›.

پولیپ / polîp/: [فرانسوی] ☜ **پُلیپ**

پولیور / polîver/: [از انگلیسی] ☜ **پلیور**

پوما / pûmā/: [فرانسوی/ از اسپانیول]/اسم. شیر کوهی ☜ **شیر**

پوند / pond/: [انگلیسی]/اسم. پۆند: ١. یەکەی کێشانەی ئینگلیزی و ئەمریکی بەرامبەر بە ٤٥٤ گرەم: **پاند** ٢. لیرەی سترلینگ؛ پارەی باوی بریتانیا.

پونز / pûnez، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پۆنس؛ پوونس؛ مێخێکی گچکەی سەرپانە بۆ ڕاگرتنی پەڕەی کاغەز یان مقەبا لە بان یان لە قەی شتێکەوە.

پونه / pûne، ـها/:/اسم. بودینە؛ پنگە؛ پنگ؛ پونگ؛ پوونگە؛ پونگە؛ پوونە؛ پینە؛ پوینە؛ بنەگیایەکی خۆڕسکی یەک ساڵانەیە لە تیرەی نەعنا کە گەڵا و گوڵەکەی بۆ دەرمان دەشێ.

▣ پونەی وحشی: خەرپنگ؛ خەرپونگ؛ خەرپونگە؛ زرپنگ؛ گریز؛ براپوونگە؛ پنگەی دەم ئاو.

پویا / pûyā/: صفت. ١. پایدار؛ خۆگرتوو؛ خۆگر؛ سەقامدار ‹چون کوه پویاست: وەک کێو خۆگرتووە› ٢. بزۆز؛ بزێو؛ کرژ؛ زرک و زیو؛ زیتەڵ؛ زرت و زینگ؛ وریا ‹ذهن پویا: بیری بزێو›.

پویائی / pûyā'î/ ☜ **پویایی**

پویانما / pûyānemā/ ☜ **انیماتور**

پویانمایی / pûyānemāyî/ ☜ **انیمیشن**

پویایی / pûyāyî، ـها/:/اسم. ١. خۆگری؛ پایداری؛ سەقامگیری ٢. بزێوی؛ بزیوی؛ بزۆزی؛ کرژی؛ زرت و زینگی؛ وریایی ❊ **پویائی**

**پـــویش** / pûyeš، ـهـا/:اسم. پێداگـــەڕی؛ پـــەیجـــۆری؛ کـــار یـــان ڕەوتی هلکـــەوشـــاندن؛ وێکـــەتـــن؛ پـــەڵ‌وپـــۆی بـــەردەوام لـــە گـــەڕان بـــۆ شتێک.

**پوینـــدگی** / pûyandegî، ـهـا/:اسم. بـــزۆزی؛ بزێوی.

**پوینـــــده** / pûyande، ـگـــان/: صـــفت. ١. پێداگـــەڕ؛ هوکـــارە بـــە پێداگـــەڕان ٢. [ادبـــی] ڕێبوار؛ ڕاویـــار؛ ڕێـــڤەنـــگ؛ ڕێـــڤنگ ‹پوینـده‌ی راه سعادت: ڕێبواری ڕێگەی ڕزگاری›.

**پویـــه** / pûye، ـهـــا/:اسم. [ادبـــی] ١. دۆمانـــە؛ گورگەلۆقە؛ قەتـــرە؛ قۆرتـــە؛ یورتمـــە ٢. ڕەفتـــار؛ جووڵە.

**پوییـــدن** / pûyîdan/: مـــصدر. متعـــدی. [ادبـــی] //**پوییـــدی**: پێداگـــەڕای؛ **مـــی‌پـــویی**: پێـــدادەگـــەڕی؛ **بپـــوی**: پێداگـــەڕە// پێداگـــەڕان: ١. گـــەڕان؛ گەڕیان؛ گێلەی؛ لـــە شـــوێنێکەوە بـــۆ شـــوێنێک چـــوون یـــان پـــەیجـــۆری شـــتێک بـــوون ٢. پـــــــشکنین؛ وشـــــــکنەی؛ پـــــــشکنای؛ هلکـــەوشـــاندن؛ هلکـــەواشـــتن؛ بـــە وردی لـــە شتێک گەڕان * **پوئیدن**. هەروەها: **پوییدنی**

■ صـــفت فـــاعلی: **پوینـــده** (پێداگـــەڕ)/ صـــفت مفعـــولی: **پوییـــده** (پێداگـــەڕاو)/ مـــصدر منفـــی: **نَپوییدن** (پێدانەگەڕان)

**پـــه** / pa(h)/: صـــوت. حـــەی؛ حـــە؛ ئـــەهـ ؛ تـــەح؛ پـــەکـــوو؛ حـــەهـ ؛ نیـــشانەی پـــێ‌نـــاخۆش بـــوون لـــەگـــەڵ ســـەرســـووڕماندا ‹پـــه! ایـــن همـــه صبر کـــردیم، حـــالا مـــی‌گـــویی پـــول نـــدارم: حـــەی! ئـــەم هەمووە ڕاوەستاوین ئێستا ئێژی پارەم نیە›.

**پهلـــو** / pahlû، ـهـــا/:اسم. ١. هێـــت؛ خالـــیگە؛ خالـــیە؛ هـــەڵـــیگا؛ بـــن‌دەســـت؛ بـــن‌دەس؛ تـــەنـــشت؛ تـــەنیـــشت؛ ترکـــەش؛ لاپـــاڵ؛ ئـــالی؛ بنچـــغ؛ بنپـــاڵ؛ کـــاوڵ؛ کـــەنـــشت؛ کێلـــەک؛ لاپیـــەنـــا؛ لاپیـــەنـــاوا؛ لا پـــەراسوو؛ فـــەڕ؛ قـــلک؛ نۆق؛ پەڕەکە؛ مـــەودای بـــن باخـــەڵ تـــا لای ڕان ٢. [مجـــازی] پـــاڵ؛ کـــست؛ لا؛ لارک؛ تـــەک؛ پاڵـــۆ؛ نـــەکـــس؛ هـــەر دوو لای شـــتێک ‹از پهلـــو نگاه کن: لە پاڵـــەوە بڕوانە›.

▣ پهلـــو بـــه پهلـــو: پـــاڵ بـــە پـــاڵ؛ لـــە لای یـــەکتریـــیەوە؛ لـــە پـــەنایـــەک؛ لـــە پـــەنـــای یـــەکـــەوە؛ لـــەپـــاڵ یـــەکتریـــدا؛ پاڵـــوو هەنترینیەنە.

▣ پهلـــو بـــه پهلـــو دادن: [ادبـــی] پـــشتدان بـــە پـــشتی یـــەکـــەوە؛ پـــاڵ دانـــە پـــاڵ یـــەکـــەوە؛ هاوکاری و پاڵپشتی یەکترکردن.

پهلـــو تهـــی کـــردن: [ادبـــی] خۆکێشانەوە؛ خـــۆ دزینـــەوە؛ فیـــسماڵکی‌دان؛ لـــە هاوکـــاری کۆمەڵ دەرچوون.

پهلـــو زدن: [ادبـــی] شـــان دان لـــە شـــان؛ بەرانبـــەری کـــردن؛ هاوشـــانی‌کـــردن؛ وێ دای پاڵ.

پهلـــو گـــرفتن: لـــەنگـــەر خـــستن؛ لـــەنگـــەر گـــرتن؛ پـــاڵ‌گـــرتن؛ وەســـتان یـــان جـــێگیر بوونی کەرەســـەی ســـەر ئـــاو (گـــەمیە، لۆتکـــە و...) لە پەنای بەستێندا.

**پهلـــوان** / pahlavān، ـهـا؛ ـان/:اسم. پاڵـــەوان؛ پـــەهلـــەوان؛ پـــالاوان؛ پـــەلهـــەڤـــان؛ گـــورد؛ قـــارەمـــان: ١. مـــرۆی زۆردار و بـــەجـــەرگ ٢. پیاوی نەبەزی چیرۆکان.

**پهلـــوان‌پنبـــه** / pahlavānpambe, -panbe، ـهـا/:اسم. [کنـایی] پاڵـــەوان‌فـــسفس؛ پاڵـــەوان پەمـــە؛ پاڵـــەوان‌پەمـــوو؛ خـــۆ هـــەڵکێشی هـــیچ لـــەدەس نـــەهـــاتوو ‹آرام کـــه ایـــن همـــه رویـــش حساب مـــی‌کـــردیم پهلـــوان‌پنبه از آب درآمـــد: ئـــارام وا هێنـــدە لـــێ دڵـــنیا بـــووین بـــە پاڵـــەوان فـــسفس دەرچوو›.

**پهلـــوانی** pahlavānî، ـهـا/:اسم. پاڵـــەوانی؛ پاڵـــەوانیـــەتی؛ چۆنیـــەتی پاڵـــەوان بـــوون ‹او از پهلـــوانی همـــان هیکـــل درشـــت و صـــدای کلفـــت را داشت: لە پاڵەوانیەتی هـــەر دەنـــگ و هـــەیکـــەڵـــێکی

زلی هەبوو›.

**پهلوانی ٢**: *صفت.* پاڵەوانی؛ سەر بە پاڵەوانییەوە ‹داستانهای پهلوانی: چیرۆکگەلی پاڵەوانی›.

**پهلوئی** / pahlû'î/ ☜ **پهلویی**

**پهلوبندی** / pahlûbandî/: *اسم.* بار و بۆ؛ باربۆ: ١. بار و بنە؛ بڕ و بەندیل؛ بارگە؛ کۆڵ؛ بەن و بیسات؛ قەباڵەتۆشە؛ تۆشەیەکی سووک (وەک نان و پەنیر) ٢. *[مجازی]* دەستگیری و یارمەتی (بە پارە).

**پهلودستی ١** / pahlûdastî/: *صفت.* بن‌دەستی؛ پاڵ‌دەستی؛ لای‌دەسی؛ جێگرتوو لە کن یا لای کەسێک یان شتێکەوە ‹مسافر پهلودستی: مسافری پاڵ‌دەستی›.

**پهلودستی ٢** /ـهـا/: *ضمیر.* پاڵ‌دەست؛ پاڵ‌دەسی ‹پهلودستی من پیر مردی بود: پاڵ‌دەستی من پیاوێکی پیر بوو›.

**پهلوفنگ** / pahlûfang/: *اسم. [نظامی]* باری ڕاگرتنی چەک لە پاڵی خۆدا.

**پهلوگاه** / pahlûgāh، ـهـا/: *اسم.* لەنگەرگا؛ پاڵگە؛ بەشی پان‌کراوەی ڕێگە و جادە کە بۆ لاگرتن و ڕاگرتنی ماشین دابین‌کراوە.

**پهلوی** / pahlavî/: *اسم.* پاڵەوی؛ پاڵەوی: ١. زمانی فارسی سەردەمی ئەشکانی و ساسانی ٢. ڕێنووسی فارسی ئەو سەردەمانە ‹خط پهلوی: خەتی پاڵەوی› ٣. /ـهـا/ سکەی زێڕینی سەردەمی پاڵەوی (١٣٠٤- ١٣٥٧ ک.هـ.) کە لە ئێراندا لێ‌ئەدرا ‹سکّەی پهلوی: سکەی پاڵەوی›.

**پهلوی** / pahlûye/: *حرف.* پاڵ؛ پاڵی؛ پاڵوو؛ کنی؛ لە کن؛ لە لای؛ لای: ١. لە لای کەسێک یا شتێکەوە ‹آمده بود پهلوی من: هاتبووە لای من› ٢. لە کن شتێکدا ‹پهلوی میز ایستاده: لە پاڵ مێزەکەدا وەستاوە›.

**پهلویی ١** / pahlûyî/: *صفت.* پاڵ‌دەستی؛ کەناری؛ لای‌دەسی ‹اتاق پهلویی: ژووری پاڵ‌دەستی›: **پهلوئی**

**پهلویی ٢** /ـهـا/: *ضمیر.* پاڵ‌دەستی؛ پاڵوو؛ پاڵووەکە ‹پهلویی من خیلی موقر بود: پاڵ‌دەستەکەی من زۆر ماقووڵ بوو›: **پهلوئی**

**پهن** / pahn/: *صفت.* ١. پان؛ بەرین؛ هەراو؛ پەهن؛ پیەنی؛ پیەن؛ لومگ؛ تەپیاس. بەرانبەر: **باریک** ‹کوچەی پهن: کۆڵانی پان› ٢. باز؛ واز؛ والا؛ ولا؛ کراوە ‹سُفرەی پهن: سفرەی باز›.

◘ پهن بودن: ١. پان بوون؛ هەراو بوون ‹رودخانە خیلی پهن بود: ڕووبارەکە زۆر پان بوو› ٢. باز بوون؛ والا/ ئاوەلا/وەلا بوون؛ بلاو بوون؛ یاویایەرە ‹سُفرە پهن بود: سفرەکە بلاو بوو›.

پهن شدن: پان بوونەوە؛ پانەو بوون: ١. لە باری پانایییەوە زۆر بوونەوە ‹در آنجا کوچە کمی پهن شدە است: لەوێدا کۆڵانەکە هێندێک پان بوتەوە› ٢. بڵاو بوونەوە؛ وەلاوە بیەی ‹پهن‌شد روی زمین: پان بووەوە بە سەر زەویدا›.

پهن کردن: ڕاخستن؛ داخستن؛ بەلاو کردنەوە؛ قەکشاندن؛ یاوتەیرە؛ پان کردنەوە لە سەر زەوی ‹قالیچە را پهن کن توی ایوان: قالیچەکە ڕاخە ناو هێوانەکە›.

**پهن** / pehen/: *اسم.* شیاکە؛ پەیین؛ پەینە؛ پێن؛ سەنێر؛ سنێر؛ سەرین؛ سەورۆ؛ ڕیخ؛ ڕێخ؛ ڕەم؛ تەقزین؛ گوهوور؛ چوسلە؛ کۆمای لاس و قەرسەقول و پشکەڵ.

◘ پهن بار کسی نکردن: *[کنایی]* چڵمیش بە کەسێکا نەساوین؛ بێ نرخ زانینی کەسێک ‹می‌روی اروپا چە بکنی؟ آنجا پهن بارت نمی‌کنند: دەچیە ئورووپا چبکەی؟ لەوێ چڵمیشت پیا ناساوێن›.

**پهنا** / pahnā، ـها/: *اسم.* ١. پانا؛ پانی؛ پەهنی؛ بەر؛ وەر. بەرانبەر: **درازا** ‹قالی را از پهنا بینداز: قالیەکە بە بار پاناوە ڕاخە› ٢. *[ادبی]* پانایی؛ هەرایی؛ بەرینایی؛ بەرینی؛ هەراوی؛ بەراوی؛ ئەندازەی بڵاوی و ڕاخراوی شتێک ‹بە پهنای دریا نظر می‌فکند: پانایی دەریای دابووە بەر نیگای›.

**پهناب** / pahnāb، ـها/: *اسم.* گۆم؛ گۆماو؛ گم؛ گۆملاخ؛ پاناو؛ پاناوکە؛ شوێنێک لە ڕووباردا کە ئاوەکەی مەند دەبێتەوە.

**پهناور** / pahnāvar/: *صفت.* بەربڵاو؛ بەرفراوان؛ پان و بەرین؛ بەرین؛ بەرپان؛ وەرپان؛ پان و پۆڕ ‹کشور پهناور: وڵاتی بەربلاو›.

**پهناوری** / pahnāvarî/: *اسم.* بەربڵاوی؛ بەرفراوانی؛ پان و بەرینی؛ بەرینی؛ بەرپانی؛ وەرپانی؛ پان و پۆڕی ‹بە پهناوری دریا: بە پان و بەرینی زەریا›.

**پهن‌برگ** / pahnbarg، ـها؛ ـان/: *اسم.* گەڵاپان؛ گەڵایەک کە لە بنەوە پان بۆتەوە.

**پهن‌غلتانک** / pehenqaltānak/ ☜ **سرگین ـ غلتان**

**پهنه** / pahne، ـها/: *اسم. [ادبی]* ڕاستایی؛ تەختایی؛ پانایی: ١. لاڕووی ئاسۆیی هەر شتێک ‹پهنەی حیات: پانایی حەوش› ٢. *[ادبی]* هێڵ؛ پانە ‹پهنەی کارزار: هێڵی شەڕ›.

**پهنه‌بندی** / pahnebandî/: *اسم.* ناوچەڕێژی؛ پانەبڕی؛ کار یان ڕەوتی دابەش کردنی سەرزەمینێک بە چەند ناوچە.

**پهنی** / pahnî/: *اسم.* پانی؛ هەراوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی پان بوون ‹پارچە بە این پهنی دیده بودی؟: پارچەی بەم پانیەت دیتبوو؟›.

**پی** / pey، ـها/: *اسم.* پەی: ١. بناغە؛ بنەڕەت؛ ڕیشەڕەگ؛ ڕەتەوێ؛ شەنگستە؛ بەشی ژێرووی دیواری ماڵ ‹آب رفته پی ساختمان را شسته است: ئاو چوەتە بنی ماڵەکە و شۆڕدوویەتەوە› ٢. *[نامتداول]* بنچاخ؛ بنەڕەت؛ بناغە؛ بناخە؛ ڕەگەز؛ بنەچە؛ بنچینە؛ پایە و بنیاتی هەر شتێک ‹پی افکندن: بنچینە دارڕژتن› ٣. شوێن؛ شۆن؛ شۆپا؛ شوێن پێ؛ یاگە پا؛ جێ پێ؛ ڕەت ‹پی او را گرفتند و رفتند: شوێنیان گرت و چوون› ٤. *[ادبی]* ڕەگ؛ دەمار ‹رگ و پی: ڕەگ و پەی›.

◘ پی افکندن/ نهادن: بەدیهێنان؛ وەدی هێنان؛ دامەزراندن؛ دامەرزانن؛ بناخە دادان؛ پەی چاندن؛ ئەوەمەرزنەی ‹این بیمارستان را روسها پی افکندند: ئەم نەخۆشخانەیە ڕووسەکان دایانمەزراند›.

پی بردن: تێگەییشتن؛ حاڵی بوون؛ پەی بردن/ بەردەی ‹آن روز به معنی حرفهایش پی بردم: لەو ڕۆژەدا لە قسەکانی تێگەیشتم›.

پی ریختن: بنەڕەت دانان.

پی کندن: بنەڕەت دانەوە؛ پەی هەڵکەندن؛ پەی دانەوە؛ پەی هەڵدانەوە؛ بنەڕەت دانەوە؛ بنەڕەت دارڕژتن ‹چند کارگر مشغول پی کندن بودند: چەن کاریگەر خەریکی بنەڕەت دانەوە بوون›.

پی گرفتن: شوێن‌گرتن؛ بە شۆن‌کەوتن؛ بە دوا کەوتن؛ شۆنی هۆرکەردەی؛ پەی‌گرتن ‹پی این کار را بگیر: شوێنی ئەم کارە بگرە›.

**پی** / peye/: *حرف.* شوێنی؛ بەدوای؛ بە شوێن؛ شۆنۆ ‹فرستاده بود پی دخترش: ناردبوویە شوێنی کچەکەی›.

**پی** / pî/: [یونانی] *اسم.* پی: ١. سێزدەهەمین پیتی ئەلف و بێتکەی یونانی ($\Pi$ و $\pi$) ٢. ☜ عدد پی، **عدد**

**پیاپی** / peyāpey, payāpey/: *قید.* پەیتا‌ـپەیتا؛ هەیتا‌ـهەیتا؛ پەستا‌ـپەستا؛ پەسا‌ـپەسا؛ پەسای‌پەس؛ هەرلەپەستا؛

لەپەسا؛ پەیاپەی؛ پەیدەرپەی؛ دوێک‌ـدوێک؛ بەشوێن یەکدا؛ بێ‌نێوان‌بڕ؛ ئازگار؛ بە دووی یەکدا؛ لـدویف ئێک؛ لە سەر یەک؛ بێ وچان و پسانەوە ‹شهر پیاپی بمباران می‌شد: شار بەپتاپەیتا بومباران دەکرا›.

**پیادە** / piyāde، ـها؛ ـگان/:/اسم. ١. پێـڕەو؛ پێڕۆ؛ سەڵتە؛ سەوادە؛ سوادە؛ پەیا؛ پیادە؛ نانا؛ وەڕێ؛ کەسێک بە پێ هاتوچوو دەکا ٢. سەرباز (مۆرەی شەترەنج، کە هەشت دانەیە): **سرباز**

پیادە: صفت. پیادە: ١. بەبێ ئامرازی ئاڵوگۆڕ ٢. [مجازی] پەرت؛ نائاگا و بێ‌خەبەر ‹در سیاست پاک پیادە است: لە سیاسەتدا تەواو پەرتە›.

▣ پیادە بودن: ١. پیادە بوون؛ سوادە بوون؛ بە بێ ئامرازی گواستنەوە بوون ٢. [مجازی] دەسخاڵی بوون؛ بێ‌دەسەڵات بوون؛ بێ پەڕوپۆ بوون ٣. [کنایی] پەرت بوون؛ ناشی بوون؛ هیچ لەبار نەبوون؛ هیچ پێ نەبوون.

پیادە شدن: ١. دابەزین؛ داوەزین؛ داخـۆزین؛ داخۆستن؛ وارئامەیش؛ واربیایش؛ داخۆزان؛ داخوزیان؛ کەوتش؛ ئەرەوەستەی؛ وەستەیرە؛ لە ماشین و... هاتنە خوارەوە ‹از ماشین پیادە شدم: لە ماشینەکە دابەزیم› ٢. داڕێژان؛ بەڕێوە چوون؛ جێبەجێ بوون ‹طرح سد پیادە شد: گەلالەی بەربەندەکە داڕێژرا›.

پیادە کردن: ١. دابەزاندن؛ داوەزاندن؛ داخۆزاندن؛ هاوردنە خوار؛ وەزنایەرە؛ ئەرەوەزنەی ٢. دابەزاندن؛ ماشینگەلی کارخانە یان تیکەگەلی ماشین لە جێی خۆی دەرهێنان ٣. جێبەجێ کردن؛ بەڕێوە بردن؛ نەخشە یان گەلالەیێک هێنانە کار.

پیادە: قید. بەپێ؛ پیادە؛ بەپیادەیی؛ بێ کەڵک وەرگرتن لە ئامرازی گواستنەوە ‹پیادە آمدم: بەپێ هاتم›.

**پیادەرو** / piyāderow، ـها/:/اسم. نانا؛ پێڕەو؛ پیادەڕێ؛ سوادەڕێ؛ پیادەڕەو؛ شوێنی پیادە لە شەقامدا.

**پیادەروی** / piyāderavî، ـها/:/اسم. بمەش؛ پیادەڕەوی؛ کار یان ڕەوتی ڕۆیشتن بە پێ.

**پیادەنظام** / piyādenezām، ـها/: [فارسی/عربی]/اسم. هێزی پیادە؛ بەشێک لە هێزی ئەرتەش کە چالاکیان لە وشکیدایە. هەروەها: **افسر پیادەنظام؛ سرباز پیادەنظام؛ لشکر پیادەنظام؛ هنگ پیادەنظام**

**پیاز** / piyāz، ـها/:/اسم. پیواز؛ پیاز؛ پیڤاز: ١. خسکە؛ خلیسکە؛ ساقەتەی خڕ و کورتی ژێر زەوینی بڕێک ڕووەک ٢. سەرک؛ سەلک؛ سەرکەپیاز؛ بن؛ بنچ؛ بنۆکەی هەڵمساوی شینکەی پیواز کە پێگەیشتووەکەی بۆیەکی توندی هەیە و تۆژاڵ‌ـتۆژاڵە ٣. بیچمێک وەک پیاز لە گیا و گیانەوەردا ‹پیاز مو: پیازی مو›.

▣ **پیاز حضرتی** ☜ **سورنجان ـ٢**

**پیاز دشتی** ☜ **سیل ـ٢**

**پیاز مو**: ریشەی موو؛ پیوازی موو.

▣ **پیاز کسی کونە کردن**: [کنایی] پێش کەوتن؛ سەرکەوتن؛ لەمپەر پەڕاندن.

**پیازچە** / piyāzče، ـها/:/اسم. ١. تەرەپیاز؛ تەرەپیواز؛ پیازۆکە؛ پیازۆک؛ پیازچە؛ پیازی شین؛ گەلا پیازی ناسک ٢. پیازۆکە؛ پیازکە؛ پیوازی چکۆلەی دەرهاتوو لە تەنیشت پیوازی گەورەدا.

**پیازداغ** / piyāzdāq/:/اسم. پیازداخ؛ بوریژ؛ ورتکە پیوازی لە ڕۆندا سوورەوکراو.

**پیازی** / piyāzî/: صفت. پیوازی؛ پیازی: ١. سەر بە پیاز ٢. پێست پیوازی؛ بەڕەنگی

پیاز یان بە ڕەنگی پێستی پیاز ٣. تۆ ـ تۆ وەک پیاز.

**پیالە** / piyāle، هـا: [یونانی]/اسم. پیالـە؛ پەیالـە؛ جـام: ١. کۆتـک؛ جامۆڵـە؛ دەفـری بچـووکی قـووڵ ٢. [ادبی] دەفـری شـەراو ‹ما در پیالـه عکس رخ یـار دیـدەایـم: لـە پیالـەدا ڕوخساری یاری خۆم بەدی کرد›.

**پیالەفروشی** / piyālefurûšî، هـا: [یونانی/ فارسی]/اسم. مـەیفرۆشـی؛ مـەیخانـەیـەکـی بچووک بە شێوەی دووکان یا هۆدە.

**پیـام** / payām, piyām، هـا:/اسم. [ادبی] پـەیـام؛ پـەیغـام؛ پـەیخـام؛ پێخـام؛ نووچـە؛ ڕاسـپێری؛ ولام؛ هـەواڵ؛ خـەبـەر ‹چشم بـە راهـم، مـرا از تـو پیامی رسـد: چـاوەڕێم بـەشـکوو هەوالیک وا لە لای تۆوە بگا›.

**پیـامآور** / payāmāvar, piyām-، هـا؛ ـان/: اسم. [ادبی] پـەیـامهێنـەر؛ پـەیـامئـاوەر؛ پەیامهێن: ١. پێغەمبەر؛ پێغـەمـەر؛ پـەیامبـەر ٢. خەبەرهێنەر؛ کـەسـێ کـە وەلامێـک دێنـێ ‹درآمـد پیـامآور سـرفراز: پـەیامهێنـەری سـەربـەرز دەرکەوت›.

**پیـامبر** / payāmbar, piyām-، هـا؛ ـان/: اسم. [ادبی] پـەیخامبـەر: ١. پـەیامبـەر؛ پێخـەمبـەر؛ پێغـەمبـەر؛ پێغـەمـەر؛ ڕاسـپاردەی خـودا ٢. [ادبی] خەبـەربـەر؛ پـەیـامهێنـەر؛ کـەسـێ کـە پەیامێک بگەیێنێتە کەسێ یان شوێنێک.

**پیامـد** / peyāmad, payāmad، هـا:/اسم. ئـەنجـام؛ شـوێنهات؛ شـوێنهات؛ کاردانـەوە؛ شۆنەما؛ ڕووداوێـک کـە لـە ئاکـام یـا بـەهـۆی کار یـا دیـاردەیـەکـەوە پێـک دێـت ‹پیامد این زمـینلـرزه مـرگ و ویرانـی بـود: شوێنهاتـی ئـەم بوومەلەرزە مردن و ماڵوێرانی بوو›.

**پیامرسـانی** / payāmresānî, piyām-، هـا:/ اسم. هـەواڵـگەری؛ کـار یـان ڕەوتی گـەیانـدنی پـەیـام ‹کـار رادیـو و تلویزیـون پیامرسانی اسـت: کاری ڕادیۆ و تەلەویزیۆن هەواڵگەرییە›.

**پیـامگیر** / payāmgîr, piyām-، هـا:/اسم. پـەیـامگر؛ ئامرازێـک بـۆ وەرگـرتنی هەواڵـی تەلەفوونی: **منشی تلفنی**

**پیـامنمـا** / payāmnemā, piyām-، هـا:/اسم. پـەیـامنـوێن؛ دەزگایـەک کـە ئاگاداریـە پێویـستەکـانی ڕۆژ لـە سـەر شاشـەی تەلەویزیۆنەوە پیشان ئەدا.

**پیـانو** / piyāno، هـا: [فرانسوی از ایتالیـایی] /اسم. پیـانۆ؛ سـازێکی سـیمی بـە شـێوەی سندۆقێکی گەورە و پایەدار.

**پیانیـست** / piyānîst، هـا: [فرانسوی]/اسم. پیانیست؛ کەسێ کە پیانۆ دەژەنێ.

**پیـپ** / pîp، هـا: [فرانسوی]/اسم. پیـپ؛ سەبیلە؛ قـەنـدە؛ قـەنگـە ‹دکتر پیپ مـی‌کـشید: دوکتور پیپی دەکێشا›.

**پیپـت** / pîpet، هـا: [فرانسوی]/اسم. پیپـت؛ لوولەیەکـی خـەتلێـدراوە لـە ئازمایـشتگادا بـۆ هەڵگرتنی بە ئەندازەی تراو.

**پیـت** / pît، هـا: [روسی]/اسم. پـووت؛ پـۆت؛ دەفرێکی ئاسـنی یـا پلاسـتیکی چوارگـۆش بـۆ جێبـەجـێ‌کـردنی شـت بـەتایبـەت شـتی ئاوەکی.

**پیتـزا** / pîtzā، هـا: [فرانسوی/ انگلیسی از ایتالیـایی]/اسم. پیتـزا؛ پێخـۆرێکی ڕۆژاوایـی کـە لە گۆشت، بیبـاری سـەوز، قارچـک و پـەنێـر و نان دروست دەکرێ. هەروەها: **پیتزافروشی**

**پیتـون** / peyton، هـا: [فرانسوی]/اسم. پـەیتـون؛ جۆرێـک مـاری زۆر گـەورەی بـێ‌ژاری هێلکـەکـەرە، لـە ڕەگـەزی ئـەژدەرمـاران، بـە چـالاکی دەخـزێ، مـەلـە دەکـات و ڕاوەکـەی بـە پێچیـان بـە دەوریـدا و گوشاردانی دەکوژێت.

**پیج** / peyc: [انگلیسی]/اسم. پـەیـج؛ بانـگ؛ قاو؛ چڕ.

▣ پیج کردن: پەیج‌کردن؛ بانگ‌کردن؛ قاو کردن؛ چڕین؛ چڕەی.
**پیجامە** / pîcāme/: [انگلیسی از فارسی] ☜ **پیژامه**
**پیجر** / peycer/: [انگلیسی]/اسم. پەیجێر؛ قاوکەر؛ بانگ‌کەر: ١. کەسێ کە دەینێرنە شوێن کەسێکی‌ترەوە تا بیدۆزێتەوە ٢. ئامرازێ کە کەسێکی پێ بانگ دەکەن.
**پی‌جو** / peycû، ـها/:/اسم. پەیدۆز: ١. /ـیان/ پەیجۆ؛ کەسێ کە لە دامەزراوەیەکدا بانگ کردنی کەسانی وەئەستۆیە ٢. دەزگایەک بۆ ئەم کارە بریتی لە میکرۆفۆن و بلیندگۆ.
**پی‌جویی** / peycûyî، ـها/:/اسم. پەیدۆزی؛ پەیجۆری: ١. کار یان ڕەوتی پرسینەوە؛ لێکۆڵینەوە؛ داپرسین؛ شوێن‌کەوتن بۆ پەیدا کردن ‹پی‌جویی کردم، معلوم شد از آنجا رفته است: پەیدۆزیم کرد، دەرکەوت لەوێ ڕۆیشتووە› ٢. کاری بانگێشتن و چڕینەوەی کەسێک لە لایەن پەیدۆزەوە بۆ هاتنەوەی ‹همین الآن راننده را پی‌جویی کنید: هەر ئێستا پەیجۆری ڕانەندەکە بن›.
**پیچ**[1] / pîč، ـها/:/اسم. پێچ؛ فیچ: ١. بورغی؛ جەڕ؛ میلەیەکی شیاردار کە بۆ بەستن، ڕاگرتن، یان ڕێک‌وپێک‌کردنی دوو یا چەند تیکە پێکەوە بەکار دێ ‹پیچ ماشین: پیچی ماشین› ٢. قەمچ؛ با؛ چام؛ خولی ڕێگا؛ چەرخی جادە ‹سر آن پیچ منتظر باش: لە سەر ئەو پیچە چاوەڕوان بە› ٣. خول؛ سوور؛ لەف ‹پیچ‌وتاب: قەمچ‌وپیچ› ٤. /پزشکی/ ژان و پێچ؛ ئێشی کرژ بوونەوەی ڕیخۆڵە بە هۆی زگچوونەوە.
▣ پیچ ارشمیدس: جەڕجەرە؛ ئامرازێ کە لە بیرەوە ئاوی پێ هەڵدەگۆزن.
پیچ اره‌ای: پێچەمشاری؛ پێچ هەڕەیی.
پیچ آلن: پێچی شەش‌سووچ: **پیچ شش‌گوش**
پیچ امین‌الدوله: گیا خەلات؛ سیا دەرمان؛ گیایەکە گوڵێکی سپی بۆنخۆش و میوەیەکی گۆشتنی ئەرخەوانی ڕەنگی هەیە.
پیچ دستی: گیرە؛ جەڕ؛ کەرستەیەک بۆ ڕاگرتن و بێ جووڵەکردنی ئەو شتە وا پێویستە کاری لە سەر بکرێ.
پیچ سرتخت: پێچی سەرتەخت.
هەروەها: **پیچ سرگرد**
پیچ شش‌گوش ☜ **پیچ‌آلن**
پیچ صحرایی ☜ پیچک‌صحرایی، **پیچک**
پیچ مهره‌ای: پێچی مۆرەیی.
▣ پیچ خوردن: پێچ خواردن؛ باو خواردن؛ تاو خواردن؛ قەمچ خواردن؛ جەڕ خواردن؛ پێچ واردەی؛ سووڕان؛ هالان؛ ئالان؛ ئالین؛ فەتلین؛ فتلین؛ لوولان؛ لوول واردەی؛ پیچان؛ وەران؛ قەگەڕان؛ خولین: ١. قەمچیان؛ پێچیان؛ پێچیەی ‹پایم پیچ خورد: پێم پێچی خوارد› ٢. سووڕان؛ چەرخان؛ لا کردنەوە؛ باخواردنەوە ‹جاده در آنجا پیچ می‌خورد: جادە لەوێوە دەپێچێتەوە›.
پیچ دادن: پێچدان؛ پێچاندن؛ پێچانن؛ وەربادان؛ فتلاندن؛ لوولاندن؛ تاودان؛ خولدان؛ بادان؛ وادەی؛ پێچنەی ‹دستش را پیچ دادم: دەستیم پیچ دا›.
پیچ کردن: پێچ‌کردن؛ بە پێچ شتێک بەستنەوە بە جێگەیەکەوە ‹قفسه را به دیوار پیچ کردم: قەفەسەکەم پیچ‌کردە دیوارەکەوە›.
- **پیچ**[2]: پیوازه. ـ پێچ: ١. شیاو بۆ پێچاندن بە شتێک یان لە جێگایەکەوە ‹مُچ‌پیچ: مەچەک‌پیچ› ٢. پێچراو ‹کاغذپیچ: لە کاغەزپیچراو›.

**پیچاپیچ** / pîčāpîč/: اسم. پێچ‌ـ‌پێچ؛ پێچاوپێچ؛ پێچ‌لەپێچ؛ پێچ‌دەرپێچ؛ پێچواپێچ؛ پێچەڵ‌پێچ.

**پیچازی** / pîčāzî/: صفت. پیچازی؛ چوارخانەی ڕەنگاڕەنگ ‹پیراهن پیچازی زیبایی پوشیده بود: کراسێکی پیچازی جوانی دە بەر کردبوو›.

**پیچان**[1] / pîčān/: صفت. [ادبی] لوول؛ پێچاو؛ پڕپێچ؛ بەپێچ؛ پێچین؛ پێچدار؛ پێچ‌خۆر؛ پێچ‌وەر؛ پێچسان؛ گرمۆڵە ‹ما در طلب وصل تو چون زلف تو پیچان: ئێمە بۆ گەیشتن بە تۆ وەک زولفی لوولت وا لە پێچداین›.

**پیچان**[2]: قید. پێچ‌ـ‌پێچ؛ بەپێچەوە؛ بە پێچ خواردنەوە ‹رود در میان دره غُران و پیچان پیش می‌رفت: ڕووبارەکە بە ناو دۆڵاندا بە گرماندن و پێچ خواردنەوە دادەپەڕی›.

**پیچاندن** / pîčāndan/: مصدر متعدی. //**پیچاندی**: پێچاندت؛ **می‌پیچانی**: دەپێچێنی؛ **بپیچان**: بپێچێنە// پێچاندن؛ پێچ دانەوە؛ پێچانن؛ پێچنەی؛ پێچنای: ١. لوولاندن؛ جەڕداین؛ داپێچانن؛ پێچدان؛ لوول‌دان؛ لوول‌داین؛ ئەڵپلەنن؛ لوولەکردن؛ وادەی؛ بادان؛ جەڕاندن؛ تەواندن؛ گەڕاندن و وەرگەڕاندن بە دەوری خۆدا ‹پیچ را پیچاندن: پێچ پێچاندن› ٢. [مجازی] هەڵشێواندن؛ ئاڵۆزکردن؛ سەخت و نامژمەڵ کردن ‹حرف را پیچاندن: قسە پێچاندن›. هەروەها: **پیچاندنی**

■ صفت فاعلی: **پیچاننده** (پێچێنەر)/ صفت مفعولی: **پیچانده** (پێچێنراو)/ مصدر منفی: **نپیچاندن** (نەپێچاندن)

**پیچ ـــ پیچ** / pîčpîč/: صفت. پێچاوپێچ؛ پێچەڵ‌پێچ؛ باودراوی تێکەلاو؛ پێچ‌ـ‌پێچ ‹این شکم بی‌هنر پیچ‌پیچ: ئەم زگە تەمبەڵە پێچەڵ پێچە›.

**پیچ ـــ پیچی** / pîčpîčî/: صفت. [گفتاری] پێچاوپێچ؛ پێچ‌لەپێچ؛ پێچ‌پێچی.

**پیچ‌خوردگی** / pîčxordegî/: اسم. [گفتاری] پێچراوی؛ پێچاوی؛ پێچیایی؛ پێچیاگی؛ پێچ خوراوی؛ پێچ‌خواردوویی؛ وادریایی؛ پێچ‌واردەیی.

**پیچ‌درپیچ** / pîčdarpîč/: صفت. پێچاوپێچ؛ پێچاپێچ؛ پێچ- پێچ؛ پێچ‌دەرپێچ؛ پێچ‌لەپێچ؛ قەمچ و پێچ؛ پێچان‌پێچ؛ پێچ و پلووچ؛ گەوە؛ ڕێگە و بواری چەوت و چێڵ ‹جادەی چالوس خیلی پیچ‌درپیچ است: جادەی چالووس زۆر پێچاوپێچە›.

**پیچش** / pîčeš/: اسم. ١. کار یان ڕەوتی پێچان؛ پێچیان؛ پێچ خواردن؛ پچان؛ پێچیەی ‹دچار پیچش روده شده بود: تووش پێچ خواردنی ڕیلەخۆ هاتبوو› ٢. [نامتداول] لادەری؛ کلایی؛ ڕەوتی پێچ خواردنەوە ‹در آنجا رودخانه پیچش مختصری داشت: لەوێدا ڕووبارەکە پێچ خواردنەوەیەکی کورتی هەبوو›.

**پیچک** / pîčak، ـها/: اسم. ١. ئالینک؛ لاولاو؛ لەولاو؛ لۆلاو؛ لاقلاق؛ لاقلاقک؛ گوڵی لاقلاق؛ ڕووەکی خزۆکی خۆ هەڵکێش بە دار و دیواردا ٢. ☜ **سیم‌پیچ**

▣ پیچک زمینی: مەلەگەوێ؛ مالۆچ؛ مالۆچە؛ گیایەکی خزۆکی گەلا خڕی گوڵ ئەرخەوانیە.

پیچک صحرایی: لاولاوی کێلگە؛ مەلەگەوە؛ مەلەگەوی؛ مالوێچە؛ مالوێنچە؛ مەلەوێچە؛ مالۆنچە؛ گیایەکە بە دار و دەور و بەریەوە پێچ دەخوا و هەڵدەکشێ، گوڵێکی گەورە و جوان و هەمەڕەنگی هەیە.

**پیچ‌گوشتی** / pîčgûštî/ ☜ آچار پیچ‌گوشتی، **آچار**

**پیچنده** / pîčande، ـها/: صفت. خاوەن

تایبەتمەندی و قەوەتی پێچ خواردن.

**پیچ‌واپیچ** / pîčvāpîč/: *صفت. [گفتاری]* پێچاوپێچ؛ پێچاپێچ؛ پێچەوپێچ؛ پێچلەپێچ؛ پێچدەرپێچ؛ پێچانپێچ؛ پێچپلووچ؛ قەمچاوپێچ؛ قەمچوپێچ.

**پیچ و تاب** / pîč-o-tāb/ ـها/: *اسم.* پێچ و تاو؛ پێچ و خول؛ قەمچ و پێچ؛ پێچ و با؛ بزووتنێک وێڕای خول و پێچ خواردن ‹رود در پای کوه پیچ و تاب می‌خورد و پایین می‌رفت: رووبارەکە لە پای کێوەکەوە پێچ و خولی ئەخوارد و دادەپەڕزی›.

**پیچ و خم** / pîč-o-xam/ ـها/: *اسم.* قەمچ و پێچ؛ پێچ و خول؛ پێچ و خەم؛ پێچ و قەمچ ‹پیچ و خم جاده: قەمچ و پێچی جادە›.

**پیچه** / pîče/ ـها/: *اسم.* ۱. *[قدیمی]* پەچە؛ پێچە؛ پووشی؛ ڕووبەند؛ ڕووبەن؛ ڕووبەنە ۲. ☜ **سیم‌پیچ**

**پیچی** / pîčî/: *صفت.* پێچی؛ پێچدار؛ بە پێچەوە ‹میخ پیچی: بزماری پێچی›.

**ـ پیچی** : *پیواژه.* ـ پێچی؛ کار یان ڕەوتی پێچاندن ‹سیم‌پیچی: سیم‌پێچی›.

**پیچیدگی** / pîčîdegî/ ـها/: *اسم.* ۱. پێچیاگی؛ پێچخواردوویی ۲. *[مجازی]* دژواری؛ ئاڵۆزی ‹پیچیدگی بحث: دژواری وتووێژ›.

**پیچیدن** / pîčîdan/: *مصدر. لازم. متعدی.* //**پیچیدی**: پێچات؛ **می‌پیچی**: دەپێچی؛ **بپیچ**: بپێچە// ☐*لازم.* ۱. پێچان؛ پێچانەوە؛ فیچان؛ باو خواردن؛ وەربادان؛ وەرپێچانەوە؛ پێچدان؛ پێچیای؛ وەرانین؛ گۆڕانی شوێنی ڕۆیشتن ‹به راست پیچیدن: بەرەو ڕاست پێچین› ۲. *[مجازی]* قوو داکەوتن؛ زۆربە ساندن؛ پڕ بوونەوە؛ برەو سەندن ‹در شهر پیچیده بود که قرار است استاندار عوض شود: لە شاردا قووی داکەوتبوو کە قەرارە پارێزەر بگۆڕدرێ› ۳. وەرپێچیان؛ تەویانەوە؛ هەڵبوونەوە ‹صدا در اتاق می‌پیچید: دەنگ لە وتاغەکەدا وەرپەیچیا› ۴. بڵاو بوونەوە؛ پەخش بوونەوە؛ بەرز بوونەوە؛ داکەوتن ‹بوی عطر در اتاق پیچید: بۆنی عەتر لە هۆدەکە داکەوت› ۵. هەڵپێچان؛ چەرخان؛ لوول خواردن؛ سووڕ خواردن؛ خول خواردن؛ بە دەور شتێکدا گەڕان. ☐*متعدی.* ۶. *[مجازی]* پێچیان؛ پێدا پێچان؛ پێچیەی؛ چوونە دەور کەسێکا؛ خۆ لێ هاڵاندن؛ بوون بە هۆی دەردیسەری کەسێک ‹این قدر به او نپیچ، بگذار کارش را بکند: ئەوەندە پێیدا مەپێچە، بهێڵە با کارەکەی بکا›. هەروەها: **پیچیدنی**

■ صفت فاعلی: **پیچنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **پیچیده** (پێچاو)/ مصدر منفی: **نپیچیدن** (نەپێچان).

**پیچیده** / pîčîde/: *صفت.* ۱. پێچراو؛ پێچیاگ؛ باخواردوو؛ باوخواردوو؛ پێچدراو؛ بادراو؛ لوولدراو؛ پێچاو؛ پێچیدە؛ پێچیا ۲. *[مجازی]* دژوار؛ سەخت؛ ئاریشە ‹مسئلهٔ پیچیده: بابەتی دژوار›.

**پیدا** / peydā/: *صفت.* پەتی؛ دیار؛ ئاشکرا؛ ئاشکار؛ خویا؛ پەیدا: ۱. وەرەچەم؛ بەرچاو؛ لە باری بەر چاودا ‹سرش از پشت درختان پیدا بود: سەری لە پشتی دارەکانەوە دیار بوو› ۲. دەرکەوتە؛ ڕوون ‹پیدا بود که می‌خواهد چیزی بگوید: دیار بوو دەیویست شتێک بڵێ›.

⊡ **پیدا بودن**: ۱. بینران؛ دیتران؛ پیویەی ۲. ئاشکار بوون؛ ئاشکرا بوون؛ دیار بوون؛ ڕوون بوون.

**پیدا شدن**: پەیدا بوون؛ پەیا بوون؛ دەرکەوتن: ۱. دۆزیانەوە؛ یۆزیایوە؛ شتی گومبوو یا نادیار دیتنەوە ‹کیفم پیدا شد؛ سر و کلاه‌اش پیدا شد: کیفەکەم پەیا بوو؛ سەر و سەکوتی دەرکەوت› ۲. دەسکەوتن؛

بەدەس‌هاتن؛ دەس‌کەوتەی ‹در آنجا چیزهایی پیدا می‌شود: لەوێدا شتگەلێک دەس دەکەون›.

**پیدا کردن:** گیرخستن؛ پەیدا کردن؛ وەدەست خستن؛ پەیا کردن: ١. دەست خستن؛ بەدەست هێنان؛ گیر هێنان؛ گیر هاوردن ‹کار پیدا کردن: کار پەیا کردن› ٢. دۆزینەوە؛ ئەوەدیەی؛ یۆسەیوە؛ شتێ ون‌بوو یا نائاشکرایەک دیتنەوە ‹یک کیف پول پیداکردم؛ دزد را پیدا کردند: کیفێکی پوولم دوزیەوە؛ دزەکەیان گیر خست›.

**پیدائی** / peydā'î/ ☜ **پیدایی**

**پیدایش** / peydāyeš/: *اسم.* کار یان ڕەوتی بەدیهاتن؛ پەیا بوون؛ ڕەخسان؛ خویا بوون؛ سەر هەڵهێنان؛ دەرکەوتن؛ هۆرئامەی ‹پیدایش جهان؛ پیدایش جوشهای ریز در ناحیەی شکم: بەدیهاتنی جیهان؛ دەرکەوتنی وردەزیپکان بە دەوری زگدا›.

**پیدایی** / peydāyî/: *اسم.* دیاری؛ دیتراوی؛ ئاشکرایی؛ چۆنیەتی دیار و لە بەرچاو بوون: **پیدائی**

**پی‌درپی**[1] /peydarpey/: *صفت.* پەساپەس؛ شۆن‌بەشۆن؛ پەیتاـپەیتا؛ لە سەر یەک؛ یەک لە دوای یەک؛ گوڕای‌گوڕ ‹سرفەهای پی‌درپی: قۆزەی لە سەر یەک›.

**پی‌درپی**[2]: *قید.* پەیتاـ پەیتا؛ پەیتا؛ پەساـ پەسا؛ هەیتاـ هەیتا؛ لە سەر یەک؛ شۆن‌بەشۆن؛ دوابەدوا ‹مردم پی‌درپی می‌آمدند: خەڵکی پەیتاـپەیتا دەهاتن›.

**پی‌درو** / peyderow, -dero: ـها/: *اسم.* دوادرەو؛ ئەو بەرهەمە لە پاش درەو کردنی مەزرا دەمێنێتەوە.

**پیر**[1] / pîr، ـها؛ ـان/: *اسم.* پیرەمێرد؛ بە تەمەن؛ کەڤنسال؛ دانسال؛ مێر؛ جاکەوتە؛ بە ساڵاچوو؛ ڕیش‌سپی؛ ڕیش‌چەرموو؛ ڕیش‌چەرمە؛ کاڵ: ١. *[ادبی]* دنیا دیتوو؛ جەهان دیتوو ‹پیری بە راهی می‌گذشت: پیرێ بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت› ٢. ڕێبەری دڵ؛ مورشید ‹پیر دیر؛ پیر طریقت: پیری دەیر؛ پیری تەریقەت›.

▣ **پیر کسی را در آوردن/ سوزاندن:** *[مجازی]* باوکی کەسێ دەرهێنان؛ بابی کەسێک هێنانە پێش چاو؛ زەحمەت و ئازاردانی زۆری کەسێک.

**پیر**[2]: *صفت.* پیر؛ بەتەمەن؛ ساڵمەند؛ لەکارکەوتوو؛ بەساڵاچوو؛ لەنگەر ‹مادرم خیلی پیر است: دایکم گەلێک پیرە›.

▣ **پیر شدن:** پیر بوون: ١. کاڵبوون؛ هەلهلین؛ تەمەن زیادکردن؛ گەڕانەوە ٢. لە ڕێزەکەوتن؛ داچەکان لە بەر تاوی ڕەنجی زۆر ‹من از دست تو پیر شدم: من بە دەستی تۆوە پیر بووم›.

**پیر کردن:** *[مجازی]* پیر کردن؛ ڕیش پێ چەرمووکردن؛ لە پا دەرهێنان؛ کەسێک بە هۆی ئازاردانی زۆر و درێژخایەنەوە پاتاڵ و پاسفندەکردن ‹زندانی شدن شوهر و فرار بچەهایش او را پیر کرد: زیندانی بوونی مێردەکەی و هەڵاتنی منداڵەکانی پیری کردن›.

**پیرابند** / pîrāband، ـها/: *اسم.* کادر؛ ئەندام.

**پیراپزشکی** / pîrāpezeškî, -pezešgî/: *اسم.* هەرکام لە پیشەگەلی سەر بە بژیشکی بۆ پاراستن یان گەڕاندنەوەی لەش ساغی.

**پیرار** / pîrār/ ☜ **پیرارسال**

**پیرارسال**[1] / pîrārsāl/: *اسم.* پێرارەکە؛ پێرار؛ ساڵی بەر لە پار: **پیرار** *[ادبی]*

**پیرارسال**[2]: *قید.* پێرارەکە؛ لە پێرارەکە؛ پێرارەنە؛ پێرارەوە؛ لە پێراردا؛ لە پێرارەوە: **پیرار** *[ادبی]*

**پیراستگی** / pîrāstegî/: *اسم.* *[ادبی]*

ڕێک‌وپێکی؛ لەباری ‹خطش در نهایت زیبایی و پیراستگی بود: خەتی لەوپەڕی جوانی و ڕێک‌وپێکیدا بوو›.

**پیراستن** / pîrāstan/: مصدر. متعدی. [ادبی] //**پیراستی**: تەوزاندت؛ **می‌پیرایی**: دەتەوزێنی؛ **بپیرا**: بتەوزێنە// تەوزاندن؛ ڕازاندنەوە؛ هەڵپەرتاوتن؛ هەڵپیتاندن؛ پەنجنین؛ ڕێک کردن؛ ڕێک‌وپێک کردن؛ جوان‌کردنەوە؛ ئاڕایش‌دان؛ نەژرنای؛ هۆرپاتەی؛ پەرچانن؛ پەرچاندن؛ چەتراندن؛ ڕازاندنەوە لە سۆنگەی لابردن و لێ‌زیادکردنەوە ‹پیراستن سر؛ پیراستن گل: سەر و قژ ڕێک کردن؛ تەوزاندنی گوڵ›.

■ صفت فاعلی: **پیراینده** (تەوزێنەر)/ صفت مفعولی: **پیراسته** (تەوزێنراو)/ مصدر منفی: **نپیراستن** (نەتەوزاندن)

**پیراسته** / pîrāste، ـها؛ ـگان/: صفت. تەوزاو؛ جوان؛ پەرچاو؛ ڕێک‌وپێک؛ ڕازاوە؛ تایبەتمەندی ئەوەی کە خراپی و ناڕێکی نەبێت ‹پیراسته سخن می‌گوید: ڕێک‌وپێک قسەدەکا›.

**پیراشکی** / pîrāškî, pîrāšgî، ـها/: [روسی] اسم. پیراشکی؛ جۆرێک خواردنی ڕۆژاواییە وەکوو کولێرەیەکی ئەستوور، بە خۆراکی جۆراوجۆری لەتۆدا.

**پیراقطبی** / pîrāqotbî، ـها/: [فارسی/ عربی] صفت. [نجوم] ژوور جەمسەری؛ ژوور هیتمی ‹ستارەی پیراقطبی: هەسارەی ژوور جەمسەری›.

**پیرامون**[1] / pîrāmûn/: اسم. دەور؛ دۆر؛ دۆرمادار؛ دەوران پشت؛ هۆرە؛ پەڕانپەڕ؛ دۆران‌دۆر؛ بۆردۆر؛ گڕ؛ هەڤێرکە؛ گرد و پەڕ؛ دۆن: ١. [هندسه] گردای‌گرد؛ دەورگر ‹پیرامون دایره: گردای گردی جەغز› ٢. پەگاڵ؛ دەور و پشت؛ دەوران‌دەور؛ هاوێردۆر؛ هێل ‹در آن پیرامون جانداری دیده نمی‌شد؛ بە پیرامون شهری رسیدند: لەو پەگاڵەدا گیانداریک نەدەبینرا. گەییشتنە دەور و بەری شار›.

**پیرامون**[2]: قید. لە دەور و بەری؛ دەور تا دەور؛ لە دەوری؛ لە دۆرمەدۆر؛ لە گردوپەڕ؛ قەراخ‌بێچاخ؛ لە گردای‌گرد ‹پیرامون باغ درخت کاشته بودند: بە دەور و بەری باخەکە داریان نابوو› ٢. سەبارەت؛ لە بارەی؛ دەربارەی؛ جە بارەو؛ لەمەڕ ‹پیرامون فقر فرهنگی بحث شد: لەمەڕی کەمایەسی فەرهەنگیەوە باس‌کرا›.

**پیرامونی** / pîrāmûnî/: صفت. دەورانەدەوری؛ دەوروبەری؛ گردای‌گردی؛ ئاقاری ‹دیوار پیرامونی: دیواری دەوراندەوری›.

**پیرامونیان** / pîrāmûniyān/: اسم. دەور و بەران؛ کەسانێک کە بەردەوام لە دەور مەقام یا کەسایەتیەکدا لە هات‌وچوودان و پێوەندی بێ‌بڕانەوەیان لەگەڵیدا هەیە ‹پیرامونیان شاه جز مشتی دزد و دغل نبودند: دەور و بەرانی شا جگە لە چەند دز و دەلەسەبازێک هیچی‌تر نەبوون›.

**پیرانه** / pîrāne/: صفت. پیرانە؛ وەکوو پیران ‹رفتار پیرانه: ئاکاری پیرانە›.

**پیرانه‌سر** / pîrānesar/: قید. [ادبی] سەرەوپیری؛ لە سەری پیریدا؛ لە کاتی پیریدا؛ سەروو پیری؛ پیری سەریە؛ پیریەنە؛ لەنگەرسەری ‹پیرانه‌سرم عشق جوانی به سر افتاد: سەرەوپیری ئەوینی لاوەتیم کەوتۆتە سەر دیسان›.

**پیراهن** / pîrāhan، ـها/: اسم. کراس؛ کەراس؛ کرواس؛ کراز؛ قوڵتە؛ گجی؛ جوە؛ گوملک؛ شەوی؛ شەی؛ شەیو؛ گجک؛ جوومە؛ متیان * **پیرهن**

▣ **پیراهن خواب**: کراسی خەو؛ جلکی نووستن.

▣ **پیراهن بیشتر پاره کردن**: [کنایی] کاڵە

زۆرتر دڕاندن؛ ئاوی زۆرتر لە جۆ خستن؛ سەر زۆرتر شکیان؛ قژ زۆرتر چەرمووُ/ سپی کردن؛ بەئەزمووتر بوون؛ دونیادیتووتر بوون؛ تەمەندارتر بوون ‹هرچه باشد او دو تا پیراهن بیشتر از تو پاره کرده و اینها را بهتر می‌شناسد: هەرچێک بێت ئەو کالەی زورتری لە تو دڕاندووە و ئەمانە باشتر دەناسێت›.

**پیراهن تن کسی بودن:** *[کنایی]* پیرقەل و برازای کەسێک بوون؛ قۆڵی کراسی کەسێک بوون؛ کەوا و سەڵتەو یۆی بیەی؛ نێوان لەگەڵ کەسێکدا زۆر خۆش بوون.

**پیراهن عثمان (درست) کردن:** *[مجازی]* بیانووی شەڕ دروست‌کردن؛ بیانوو خۆش کردن بۆ شەڕنانەوە؛ کردنە داستان؛ کردنە بیانوو؛ کردنە تڕ خەسرەو؛ کردنە داردەست ‹شرکتش در گردهمایی را پیراهن عثمان کردند و به زندانش انداختند: بەشداری کردنی لە کۆبوونەوەکەیان کردە بیانوو بۆی و خستیانە زیندانەوە›.

**پیرایش** / pîrāyeš ـها: *اسم. [ادبی]* کار یان ڕەوتی تەوزاندن؛ ڕازاندنەوە؛ جوان کردنەوە؛ خشلاندن؛ خەملاندنەوە؛ تیف‌تیفەدان.

**پیرایشگری** / pîrāyešgarî: *اسم.* ۱. *[ادبی]* ڕازێنەری ۲. بزووتنەوەی ڕێخۆشکەری دینی مەسیحی لە ئینگلیستان و ئەمریکای سەدەکانی ١٦ و ١٧ زایینی.

**پیرایه** / pîrāye ـها: *اسم. [ادبی]* شتی جوان (لە زێڕ و زیوەر یان وشە و بێژە) بۆ ڕازاندنەوە و ڕێک‌وپێک‌کردن.

**پیرچشمی** / pîrčešmî: *اسم.* پیرچاوی؛ دووربینی چاو بەهۆی تەمەن چوونە سەر.

**پیرزن** / pîr(e)zan ـها؛ ـان: *اسم.* پیرەژن؛ پیریژن؛ دایاپیر؛ ژنەپیرێ؛ پیرەژنێ؛ دادا؛ کەڤنەژن؛ تایەن؛ پۆپ چەرموو؛ پۆپچەرمگ؛ ژنی بە تەمەن و بە ساڵاچوو ‹پیرزن خوش‌سیمایی بود: پیرەژنێکی ناوچاو ڕوون بوو›.

**پیرمرد** / pîr(e)mard ـها؛ ـان: *اسم.* پیرەمێرد؛ پیرەمێر؛ پیرەمەرد؛ پیرەپیاو؛ پیرەپیا؛ پیاوی پیر؛ ئیختیار ‹بگذار پیرمرد سوار شود: بێڵانە ئەو پیرەمێردە سوار بێت›.

**پیرن** / pîran/ ☜ **پَرَند**[2]

**پیرند** / pîrand/ ☜ **پَرَند**[2]

**پیرو**[1] / peyrow, peyro/: *اسم.* ۱./ پیروان، peyrovān/ شوێن‌کەوتوو؛ شوێنڕا؛ پاشەڕەو ‹ما پیرو تو هستیم: ئێمە شوێن‌کەوتووی تۆین› ۲. لایەنگر؛ شوێن‌کەوتوو؛ وەدووکەوتوو؛ ‹پیرو اسلام: لایەنگری ئیسلام› ۳. /ـها/ شوێنگر؛ پشتگر؛ پەیڕەو؛ برووسکە یان نامەیەک کە بۆ پشتگری لە داخوازێک دەنێردرێت ‹یک پیرو بفرستید، ببینید جواب چه شد؟: پشتگرێک بنێرن، بزانن جواب بوو بەچی؟›.

**پیرو**[2]: *قید.* بە شوێنی؛ بە دوای؛ بە شوێنگری؛ بە پشتگری؛ بە پێ‌گرتی؛ بە پەیڕەو؛ بە ژێر چاو؛ بە دواکەوتە؛ دماو؛ شۆنوو ‹پیرو فرمایشات متین رییس‌جمهور: بەدوای وتەگەلی گونجاوی سەرۆک‌کۆماردا›.

**پیر و پاتال** / pîr-o-pātāl ـها: *صفت. [تعریض]* پیر و زورهان؛ پیر و پاتاڵ؛ پیر و داکەوتە؛ پیر و کەنەفت؛ پیر و پاچاڵ؛ پیر و خەرف؛ هەترەگ؛ پیر و لە کارکەوتوو؛ داکەوتوو ‹یک مشت پیر و پاتال می‌نشینند و برای جوانان تصمیم می‌گیرند: بڕێ پیر و زورهان دادەنیشن و بۆ لاوەکان بڕیار دەدەن›.

**پیروز** / pîrûz: *صفت.* ۱. سەرکەوتوو؛ لە سەر؛ سەرکەفتی ‹تیم ما پیروز است: تیمی ئێمە سەرکەوتووە› ۲. پیرۆز؛ هەزەک؛

ممبارەک؛ هەزەخ ‹نوروزتان پیروز: نەورۆزتان پیرۆز›

**پیروزمند** / pîrûzmand، ـان/: صفت. سەرکەوتوو؛ بە ئاواتگەیشتوو لە کاردا ‹ارتش پیروزمند: ئەرتەشی سەرکەوتوو›.

**پیروزمندانە** [1] / pîrûzmandāne/: صفت. سەرکەوتووانە ‹نبرد پیروزمندانە: شەڕی سەرکەوتووانە›.

**پیروزمندانە** [2]: قید. سەرکەوتووانە؛ بە سەرکەوتوویەوە ‹سپاهیان پیروزمندانە بازگشتند: چەکدارەکان سەرکەوتووانە گەڕانەوە›.

**پیروزی** / pîrûzî، ـها/: اسم. سەرکەوتویی: ۱. کار یا ڕەوتی گلاندنی هەڤبەر لە شەڕ یا کێبەرکێدا ‹آزاد در مسابقات پیروزی بزرگی بدست آورد: ئازاد لە کێبەرکێدا سەرکەوتنێکی مەزنی بە دەست هێنا› ۲. ڕەوتێک بۆ وەدەست هێنانی ئامانجێ کە پێویستی بە هەوڵ و تێکۆشانێکی زۆرە ‹پیروزی در زندگی: سەرکەوتوویی لە ژیاندا›.

**پیروی** / peyravî, peyrovî، ـها/: اسم. پەیڕەوی؛ شوێنەڕای: ۱. دانەدوویی؛ شوێنکەوتوویی؛ کار یان ڕەوتی مرید بوون؛ بە گوێکردن و دواکەوتنی دەستووری، کەسێ، ئاکارێ، بنەمایێ یان یاسا و شێوازێک ‹پیروی از اسلام: پەیڕەوی لە ئیسلام› ۲. شوێنگیری؛ پاشەڕەوی ‹آرام زد به آب و ما هم از او پیروی کردیم: ئارام دای لە ئاو و ئێمەش کەوتینە شوێنی›.

**پیرهن** / pîr(e)han/ ☜ **پیراهن**

**پیری** / pîri/: اسم. پیری؛ زورهانی؛ دۆخ یا چۆنیەتی پیر بوون ‹دوران پیری: سەردەمی پیری›.

**پیری** / piri/: اسم. [تعریض] پیرەکۆن؛ پیرەمەرد؛ پیرەپیاو؛ پیرەمێرد ‹پیری عجب زوری دارد!: پیرەکۆن چ هێزێکی هەیە!›.

**پیریزی** / peyrîzî، ـها/: اسم. ۱. کار یان ڕەوتی بنەڕەت دانان؛ بنەڕەت نیان؛ بنەڕەت متەی؛ بناغە دارژتنی خانوو ‹برای پیریزی ساختمان چند کامیون بتن لازم داریم: بۆ بنەڕەتنیانی ئەم خانووە چەن کامیۆن بتوونمان پێویستە› ۲. بناغەدارێژی؛ بنیاتنەری؛ بناغەدانەری ‹پیریزی دانشگاه بە منظور تربیت نیروی متخصص: بناغەدارێژی زانکۆ بە مەبەستی پەروەردەکردنی زانیاران›.

**پیری‌شناسی** / pîrîšenāsî/ ☜ **سالمَندشناسی**

**پیز** / pîz/: [فرانسوی] اسم. پیز؛ یەکەی ئەندازەپێوی تەوژم و فشار بەرامبەر بە ۱۰۰۰ پاسکاڵ.

**پیزر** / pîzor/: اسم. جەگەن؛ گیایەکە لاسکی سێ سووچە لە زەلکاودا دەڕوێ.

▣ **پیزر لای پالان کسی گذاشتن**: [تعریض] ئاو کردنە پای کەسێک؛ شووتی دەبن هەنگل کەسێک نان؛ سابوون چێروو پاو یۆی نیەی؛ پێدا هەلگوتن و خۆڵتەکردن بە کەسێک بۆ بەڕێوە بردنی کارێک یان مەبەستێک ‹آن‌قدر پیزر لای پالانش گذاشت که آخر پول را از او گرفت: ئەوەندە ئاوی کردە پای ئاخری پارەکەی لێ‌ساند›.

**پیزری** / pîzorî، ـها/: صفت. [گفتاری، مجازی] داهێزاو؛ فش؛ خاو؛ سس؛ سڕ؛ بێ‌هێز؛ لەرزۆک ‹پیرمرد پیزری: پیرەمێردی داهێزاو›.

**پیزی** / pîzî/: اسم. [مستهجن] سوو؛ خڕک؛ کۆمی؛ بالوور؛ تریزە؛ قیت؛ کونای قنگ؛ کونی قوون؛ ولۆ عننێ.

▣ **پیزی گشاد**: [کنایی] حیزەڵ؛ تەمەڵ؛ تەوەزەل؛ تەپە؛ لەش‌گران؛ قن‌قورس؛ تەپلمۆس؛ تەپلۆس.

▣ **پیزی کاری را داشتن**: [مجازی] بە ورە و هێز بوون بۆ کارێک؛ بێ‌باکی و ئازایەتی

لە خۆ پیشاندان بۆ بەڕێوە بردنی کارێک.

**پیزی کسی را جا انداختن**:/تعریض/ تیکە بۆ کەسێک گرتنەوە؛ تیکە بۆ کەسێک جاوین؛ جێبەجێکردنی کاری کەسێک بەجێگەی ئەو.

**پیژاما** / pîjāmā/: [فرانسوی از فارسی] ☜ **پیژامه**

**پیژامه** / pîjāme، ـها/: [فرانسوی از فارسی] /اسم/ بیجامە؛ بیجامێ؛ ژێرشواڵ: **پیژاما؛ پیجامه**

**پیس** / piyes، ـها/:/اسم/ نمایشنامە؛ نمایشتنامە.

**پیس** / pîs/:/اسم/ ١. ☜ **پیسی-١** ٢./ـها/ پەڵە؛ لکوپیس؛ پیس؛ لەکەی دیار: **لک‌وپیس**

**پیست** / pîst، ـها/: [فرانسوی]/اسم/ پیست؛ شەمیتۆک؛ خیزەلان؛ زەوی یا هێڵی تەیار کراو بۆ دیلان یا کایە ‹پیست مسابقه: پیستی کێبەرکێ›.

**پیسه**[1] / pîse/ ☜ **پیسی-١**

**پیسه**[2]: صفت. ١. بەڵەک؛ بازگ؛ بازەڵە؛ ڕەش و سپی؛ سیاوچەرمە ٢. دووڕەنگ؛ بازۆ؛ بازگ؛ بازە؛ بازەڵە ٣. خاڵ‌خاڵ.

**پیسی** / pîsî/:/اسم/ ١. گولی؛ بەڕەس؛ پیسی؛ نەخۆشینی پێستی: **بَرَص؛ پیس؛ پیسه** ٢./گفتاری، کنایی/ داماوی؛ ناتەوانی؛ قوڕەماوی؛ دەس‌تەنگی؛ هەژاری؛ بێچارەیی؛ گیرکەوتوویی؛ بەرقاڵی.

▣ **به پیسی افتادن**:/مجازی/ تێدا مانەوە؛ کەوتنە ڕۆژڕەشی؛ دامان؛ بێچارە بوون؛ ڕۆژڕەش بوون؛ کەوتنە جێەوە ‹فردا کە بە پیسی افتادی، معنی حرفهایم را می‌فهمی: دوارۆژ کە تیدا مایەوە، ئەزانی چی ئێژم›.

**پیش**[1] / pîš/:/اسم/ بۆرە؛ ئەو بزوێنە کە وەکوو واوێکی چکۆلەیە ( ُ ) و دەچێتە سەر پیتەوە: **ضَمّه**

**پیش**[2]: صفت. بەر؛ لە پێش؛ پێشوو؛ بەرگین؛ وەرین؛ وەر؛ بەر لە دیتران ‹دندان پیش: ددانی پیشوو›.

▣ دندان پیش ☜ **دندان**

شب‌پیش ☜ **شب**

**پیش**[3]: قید. ١. پێش؛ پێشەوە؛ بەرەو ڕووی مەبەست ‹پیش می‌رفت: ئەچووە پێشەوە› ٢. زووتر؛ لەوەو بەر؛ پێشتر؛ وەڵێنە؛ لە پێشەوە؛ لە بەرەوە ‹از پیش می‌دانست: پێشتر دەیزانی› ٣. لە کن؛ لە لای؛ لە پاڵ؛ لە تەنیشت؛ لجەم؛ پاڵوو؛ لە بەرانبەر یان لە نزیکی شتێکەوە ‹پیش من: لە لای من›.

▣ پیش پای کسی: بەر لە پای کەسێک؛ بەر لە هاتنی کەسێک؛ وەڵوو پاو یۆینە؛ وەر جە پاو یۆی؛ ڕاست پێش لە هاتنی کەسێک.

پیش چشم: لە بەر چاو؛ لە پێش چاوی؛ ڕووبەڕووی؛ وەرە چەموو؛ وەراوەروو.

پیش رو: لە ڕووبەڕوودا؛ لە پێش‌چاودا؛ لە بەردەمدا؛ ڕووەوڕوو؛ لە ڕووەوە؛ لانە؛ وەراوەرەوە؛ لە بەرامبەردا ‹پیش رو تعریف می‌کند، پشت سر بد می‌گوید: لە ڕووەوە هەڵدەڵێ، لە پشت‌سەرەوە پەڵ دەڵێ›.

از پیش: زووتر؛ لە بەر؛ لە پێش؛ بەر لە؛ لە پێشەوە؛ لە بەرەوە؛ جە وەڵێنە ‹از پیش می‌دانستم او نخواهد آمد: لە پێشەوە دەمزانی نایێت›.

▣ پیش آمدن: ١. پێش هاتن؛ ڕوودان؛ پێش‌ئامەی؛ ڕوەدەی ‹اگر مشکلی پیش آمد به من خبر بده: ئەگەر گرفتێک ڕووی دا هەوالم پێ‌بدە› ٢. هاتنە بەرەوە؛ هاتنە پێشەوە ‹پیش آمد و شناسنامه‌اش را نشان داد: هاتە بەرەوە، ناسنامەکەی نیشاندا›.

پـیش آوردن: ۱. هێنانـه پێـشەوە؛ هێنانـه پـێش؛ هاوردنـه بـەرەوە ‹دستش را پیش اورد: دەسـتی هینایـه پـێشەوە› ۲. پـێش هێنـان؛ خـۆش‌کـردن؛ وەش‌کـەردەی؛ دروسـت کـردن ‹دردسـر پیش اوردن: دەردیـسەر دروست کردن›.

پیش افتـادن: کـەوتنـه پێـشەوە؛ پـێش کـەوتـن؛ وەپـێش‌کـەوتن؛ کـەوتنـه بـەرەوە؛ کـەوتـەی وەڵـێوە ‹قهرمـان سیاهپوسـت پیش افتاد: پاڵەوانی ڕەش‌پێست کەوتە پیشەوە›.

پـیش انـداختن: خـستنه پێـشەوە؛ پـێش خـستن؛ وەپـێش خـستن؛ وسـەی وەڵـێوە: ۱. خـستنه بـەرەوە ‹امتحـان را ۱۰ روز پیش انداختند: ئـەزموونـەکـەیـان ۱۰ ڕۆژ خـستە بەرەوە› ۲. خـستنه بـەر؛ دانـەبـەر ‹آزاد پاسبان را پیش انداخت و بـا خـودش بـرد: ئـازاد پاسەوانەکەی خستە بەر و بردی›.

پـیش بـردن: ۱. بردنـه بـەرەوە؛ بردنـه سـەرەوە؛ سـەر خـستن ‹او سرانجام حـرفش را پیش برد: لـه ئاکامـدا قـسەی خـۆی بردە بەرەوە› ۲. بـەرەو بـەر بـردن؛ بـەرەو پـێش بـردن؛ بردنـه بـەرەوە ۳. ڕێـک خـستن؛ گەشە پێـدان؛ پـێش خـستن؛ وسـەیـەوە ڕا؛ ڕێک وسەی.

پیش پای کسی بلند شدن: لـه بـەر کـەسـێک هـەڵسان؛ لـه پـێش کـەسـێکدا هـەستان؛ هەستان له بەر کەسێک بۆ ڕێز لێنانی.

پیش رفتن: پـێش‌چـوون؛ ڕۆینـه بـەرەوە: ۱. بـەرەو پـێش چـوون؛ بـەرەو بـەر چـوون؛ کـەوتنـه بـەر ۲. پێـشکەوتـن؛ پێـشڕەوت کردن؛ چوونه سەر.

پـیش زدن: تـەتـەڵـەکـردن؛ لاتیـل‌کـردن؛ گێـل/ گـیج دان؛ تـەتـەڵـەوازکـەردەی؛ وەرلەنگەری‌کەردەی؛ هـەڵدانی دانـەوێڵە و خەلە و جیا کردنەوەی خاک و خۆڵی.

پـیش کـردن: لادرزکـردن؛ لاتـرەک کەردەی؛ تەواو کـپ نـەکـردن؛ دەلاقـه یـان درگـا بـه جۆرێـک بـەسـتن کـه بـه پـاڵ پێوەنـان بکرێتـەوە ‹در را پیش کرده بودم باد بـازش کـرد: درگاکـەم لادرز کردبـوو بـا کردیەوە›.

پیش‌کشیدن: ۱. بـەرچـاو خـستن؛ خـستنه روو ۲. خـستنه بـەر بـاس؛ هێنانـه پێـشەوە؛ هاوردنه بەرەوە.

پیش‌گرفتن: گرتنـه پـێش؛ گرتنـه بـەر؛ دانـه بـەر؛ گێرتـەینـه وەر؛ هـەڵـبژاردن (لـەمـەڕ ڕێگـا، کـردەوە و کـار) ‹ایـن روشـی کـه تـو در پیش گرفتەای تـو را بـه جـایی نمـی‌رسـاند: ئـەم ڕێگایـه تـۆ گرتووتـه پـیش بـه هـیچ کوێـت ناگەیێنێ›.

**پـیش**[4]: حـرف. پـێش؛ بـەر؛ وەر؛ پێـشتر لـه کات، جێ یان ڕووداوێک.

◙ **پیش از تاریخ**: بەر لـه مێـژوو؛ پـێش مێـژوو؛ له سەرهەڵـدانی مرۆڤـەوە هـەتـا سـەرەتـای نووسین.

**پیش از ظهر**: بـەر لـه نیـوەڕۆ؛ بەلـه نیمـەڕۆ؛ بـەرای نیـوەڕۆ؛ پـێش لـه نیـوەڕۆ؛ وەڵـێ نیمـەڕۆی؛ بـەر لـه کـاتژمێری ۱۲، لـه ۱۰ بەو لاوە.

**پیش از میلاد**: پـێش زایـین؛ بـەر لـه زایـین؛ پێش له دایک بوونی حەزرەتی عیسا.

◙ **پیش از آخوند بـه منبـر رفـتن**: *[تعریض]* بـەر له مەلا نوێژ دابەستن؛ پـێش لـه نـۆرە، قـسه یا کارێ‌کردن.

**پیش ـ**[5]: *پیشوازە*. پـێش‌ـ : ۱. بـەسـراو و لکـاو به بەرەوە ‹پیش‌آهنـگ: پـێش‌ئاهـەنـگ› ۲. سـەر به داهاتوو ‹پیش‌بینی: پێش‌بینی›.

**پـیش‌آزمـون** / pîšāz(e)mûn، ـهـا/: *اسم*. پـێش‌ئـەزمـوون؛ ئـەزموونێـک کـه بـۆ هـەڵـسەنگانـدنی خوازیـارانی فێرکـاری

دەگیردرێت.

**پیش‌آسیا** / pîšāsiyā/ ☜ (دندان) آسیای کوچک، **آسیا**

**پیش‌آگاهی** / pîšāgāhî/: /اسم. پێش‌ئاگاداری؛ ئاگاداری یا ناسینەوەیەک کە بەر لە ڕووداوێک تەیار کرابێت.

**پیش‌آگهی** / pîšāgahî، ـها/: /اسم. پێش‌ئاگەداری: ١. پێش‌ئاگاداری؛ ئاگاداریەک کە لە پێشەوە درابێت ٢. *[پزشکی]* پێش‌بینی دەوران و ئاکامی نەخۆشیەک.

**پیشاب** / pîšāb/: /اسم. میز؛ مێز؛ گمێز؛ گمیز؛ شاش؛ پێشاو.

**پیشابدان** / pîšābdān، ـها/: /اسم. لەگان؛ کاسەمیز؛ جێ گمێز؛ دەفری میزتنی ئەو نەخۆشانەی کە هێزی سەر دەساو چوونیان نیە.

**پیشابراه** / pîšābrāh/: /اسم. ڕێ گمێز؛ ڕێ ڕژانە دەرەوەی میز لە میزدانەوە.

**پیشاپیش** / pîšāpîš/: قید. ١. لە بەر؛ لە پێش؛ پێشاپێش؛ وەلوو ‹پیشاپیش همه می‌رفت: لە بەر هەمووانەوە دەڕۆیشت› ٢. زووتر؛ لە پێشدا؛ پێشەکی؛ پێشتر؛ وەلێنە؛ زووتەر؛ بەر لە کات و ساتی بڕیاردراو ‹پیشاپیش غذا را پخته بودم: زووتر چێشتەکەم لێنابوو›.

**پیشامد** / pîšāmad/: /اسم. ڕووداو؛ پێشهات؛ پێشهاتە؛ پێشامە؛ ڕیوار؛ کەت؛ هەلکەفتێ ‹مرگ دوستم پیشامد ناگواری بود: مەرگی هەڤالەکەم ڕووداوێکی دڵتەزێن بوو›.

**پیش‌آمدگی** / pîšāmadegî, pîš'ā-، ـها/: /اسم. دەرپەڕیوی؛ دەرکەوتوویی؛ زۆپی؛ زەقی؛ بەپڕایی؛ سکنیاوی؛ ڕەوتی هاتنە پێشەوەی سروشتی شتێک (وەک ئاو یان وشکی) ‹پیش‌آمدگی دیوار: دەرپەڕیوی دیوار›.

**پیش‌امضا** / pîš'emzā/: [فارسی/ عربی] /اسم. پێش‌ئیمزا؛ پاراف؛ ئیمزای پێشنووسی نووسراوەیەکی ڕەسمی.

**پیش‌اندیشی** / pîšanddîšî/: /اسم. کار یا ڕەوتی لە پێشەوە داوەری یان بڕیاردان.

**پیشانه** / pîšāne/: /اسم. *[نامتداول]* ژوور؛ سەرەوەی هۆدە؛ شوێنی دوور لە درگا.

**پیشانی** / pîšānî/: /اسم. ناوچاو؛ نێوچاوان: ١. جەمین؛ هەنیە؛ هەنی؛ ئەنی؛ تەوێڵ؛ توێڵ؛ تیول؛ تێول؛ تەوێلە؛ تاق‌توێڵ؛ جەبین؛ نۆتک؛ نەهتک؛ زەعتک؛ تێڵ؛ پشنی؛ نەعتک؛ فکلە؛ پێشانی؛ نەقسوور؛ ناڤیروو؛ تەمۆ؛ بەشێ لە لای ژووروی ڕوومەت، لە سەر چاوەوە هەتا خەتی مووی سەر ٢. چارەنووس؛ بەخت؛ ناوچاو؛ ناڤچاڤان (کە ڕابردوان وایان دەزانی چارەنووسی هەرکەس لە سەر توێڵیەوە نووسراوە) ‹این در پیشانی‌اش بود که باید می‌آمد و با این دختر ازدواج می‌کرد: لە نێوچاویدا نووسرابوو کە بێت و ئەم کچە بخوازێت›.

▣ پیشانی بر خاک نهادن: *[ادبی، کنایی]* تەوێڵ نانە سەرخاک؛ بەندەگی و خاکەساری پیشان‌دان ‹پیشانی بر خاک نهاد و گریست: تەوێڵی نایە سەر خاک و گریا›.

پیشانی کسی بلند بودن: بەختی کەسێک بەرز بوون؛ بەختیار بوون ‹نگران نباش موفق می‌شوی، پیشانی‌ات بلند است: نگەران مەبە سەردەکەوی، بەختت بەرزە›.

**پیشاهنگ** / pîšāhang، ـها؛ ـان/: /اسم. پێشاهەنگ؛ پێشەنگ: ١. سەرقافڵە؛ سەرکاروان؛ سەرپەل؛ سەرگەلە؛ هووره شۆپ؛ ڕەمکێش؛ بەراهی؛ بەرایی؛ پێشایی؛ ئەوەی لە بەرەوەی گرۆیەکدا دەڕوا ٢. ڕچەشکێن؛ پێش‌هەنگاو ٣. ئەندامی ڕێکخراوی پێشاهەنگی ‹من در مدرسه

... بودم: من له فێرگەدا ... بووم›.

پیشاهنگی / pîšāhangî/: اسم. پێشاهەنگی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی پێشەنگی کردن؛ سەرقافلەیی کردن؛ سەرکاروانی کردن؛ بەراهی کرن ٢. ڕێکخراوی ڕاهێنان و بارهێنانی تایبەتی بۆ تازەلاوان.

پیشباز / pîšbāz/ ☜ **پیشواز**

پیشبال / pîšbāl/: اسم. بەرداوێن؛ بەردایەن؛ وەردامنە؛ بەشی پێشینی داوێنی جلوبەرگ ‹... پیراهن: ... کراس›.

پیش‌بخاری / pîšboxārî، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. بالاڕف؛ سەرتاق؛ تاقەچکۆلەی سەر دیوار.

پیشبرد / pîšbord/: اسم. پێشبەری؛ پێشکەوتی؛ کار یان ڕەوتی: الف) پێشکەوتن؛ پێشکەفتن؛ گەشە پێدان؛ بالابردن؛ بەرەو پێش بردن ‹... فعالیت‌های عمرانی مستلزم صرف پول است: ...ی کارکۆیی ئاوان‌کردنەوە پێویستی بە خەرج کردنی پارەیە› ب) سەرکەوتن؛ گەییشتن؛ سەرخستن ‹برای ... منظورش بە سارا خانم متوسل شد: بۆ ... بە مەبەستی دەستەو داوێنی سارا خانم بوو›.

پیش‌برگ / pîšbarg، ـها/: اسم. پروفورما.

پیش‌بند / pîšband، ـها/: اسم. بەروان؛ بەروانە؛ بەروانک؛ بەرڤانک؛ بەرڤانەک؛ بەروانکە؛ بەرکۆش؛ وەربانە؛ وەربەن؛ بەرەوپێڵ؛ بەرەڵبێنە؛ بەرهەڵبێنە؛ بەرانپیل؛ پۆشەنێک بەندارە کە تەواو یان بەشێک لە بەرووی جلوبەرگ دادەپۆشێ و بۆ پیس یان تەڕ نەبوون لە کاتی کارکردن یان نان خواردندا دەیبەستن ‹... بچە: بەروانکەی منداڵ›.

پیش‌بها / pîšbahā/: اسم. [نامتداول] پێشەکی؛ پێشبایی؛ بێعانە؛ پارەی پێش.

پیش‌بین / pîšbîn/: صفت. پێش‌بین؛ خاوەن توانایی لە پێش‌بینی کردندا.

پیش‌بینی / pîšbînî، ـها/: اسم. کاڤشکی؛ بەربووری؛ پێش‌بینی؛ کار یان ڕەوتی لە پێشەوە هەست پێ کردنی ڕووداو یان پەیهاتەیەک و ڕەچاوکردنی چارەیەکی باش بەو بۆنەوە ‹آمدن بهمن را پیش‌بینی می‌کردم: هاتنی هەرەسم پیش‌بینی دەکرد›.

پیش‌پاافتاده / pîšepā'oftāde/: صفت. بێبایەخ؛ لاکەوتە ‹موضوع پیش‌پاافتاده: بابەتی بێبایەخ›.

پیش‌پرداخت / pîšpardāxt، ـها/: اسم. پێشەکی؛ بەعی؛ بێعانە؛ کرێ لە پێش کاردا.

پیش‌پرده / pîšparde، ـها/: اسم. پێش‌پەردە؛ کورتە شانۆ یان ئاهەنگێک کە بەر لە ئەسڵی شانۆکە یا لە نێوان دوو پەردەدا بەڕێوە دەچێ.

پیش ـ پیش[1] / pîš-pîš/: قید. [گفتاری] پێشاپێش؛ پێشەکی؛ بەر لە هەر شتێک ‹پیش‌ـ پیش به او گفته بودیم که می‌آییم: ... پێمان گوتبوو کە دێین›.

پیش ـ پیش[2] / piš-piš/: صوت. پش ـ پش؛ پشی ـ پشی؛ پشێ ـ پشێ؛ دەنگێکە بۆ قاو کردنی پشیلە ‹پیش ـ پیش کردم، گربه آمد توی اتاق: پش‌ـ پشم کرد، پشیلەکە هاتە هۆدەکە›.

پیشت / pîšt/: صوت. ختە؛ فسە؛ فس؛ ختەفس؛ دەنگێکە بۆ وەدەرنانی پشیلە ‹گربه را پیشت کن برود: ختە لەو پشیە بکە با بچێ›.

پیشتاب / pîštāb/: اسم. ١. [ـها] شەش وەرب؛ شەش‌ئاگر؛ تاوهەنگاو؛ تاوهەلات؛ جۆرێک دەمانچەی لوولە درێژی کۆن ٢.

[ادبی] کازیوە؛ کازێوە؛ کاز و کووز؛ بوولێلەی بەیانی؛ رووناکیەکی کەم کە بەر لە هەلاتنی خۆر، ولات روون دەکاتەوە.

**پیشتاز** / pîštāz/: صفت. پێشەنگ؛ پێشرۆ؛ پێشرەو؛ رەمکێش؛ سەرگەلە؛ سەرجەلە؛ بەزا لە بەرای هەموانەوە ‹اسب پیشتاز: ئەسپی پێشەنگ›.

**پیشتر** [1] / pîštar/: صفت. پێشتر؛ پێشووتر؛ بەرتر؛ پێشوو: ١. بەروو؛ پێشوو ‹در سالهای پیشتر آلودگی هوا کمتر بود: لە سالانی پێشوودا پیسی هەوا کەمتر بوو› ٢. پێش ‹آزاد در کلاس از همه پیشتر بود: ئازاد لە پۆلەکەدا لە هەموو پێش بوو›.

**پیشتر** [2] / ـها/: قید. ١. ئەوسا؛ ئەوەدەم؛ ئەوکات؛ ڤێ‌گاڤێ؛ ئەوساکە؛ لەوێ‌چاخێدا؛ چیوەڵ؛ چاوەلی؛ لەمەو پێش؛ پێشووتر؛ زووتر؛ وەڵتەر؛ لە مێژینەتر؛ لە زوودا؛ زوو؛ لە کات و ساتی رابردوودا ‹پیشتر به این مدرسه می‌رفتم: زووتر دەچوومە ئەم قوتابخانەیە› ٢. لە پێشترەوە؛ لە پێشەوە؛ لە بەرەوە؛ وەرەنە ‹آرام پیشتر می‌رفت: ئارام لە پێشەوە دەرۆیشت› ٣. لە پێشەوە؛ لە پێشترەوە؛ لە بەرەوە؛ وەڵێنە؛ لە بەرتر ‹تو پیشتر برو: تۆ لە پێشەوە برۆ›.

**پیشخان** / pîšxān، ـها/: اسم. ١. مێزەک؛ پێشخوان؛ مێزێ کە فرۆشیار لە پشتیەوە شتومەک دەفرۆشێ: **پیشخوان** ٢. رێودالان؛ پێشخان؛ پێشخانە.

**پیش‌خدمت** / pîšxedmat، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. پێشخزمەت؛ پێشخەومەت؛ بەردەست؛ وەردەس؛ خەومەتکار؛ خزمەتکار.

**پیشخدمتی** / pîšxedmatî/: [فارسی/ عربی] اسم. پێشخزمەتی؛ بەردەستی؛ وەردەسی؛ کاری پێشخزمەت.

**پیش‌خرید** / pîšxarîd/: اسم. سەلەم؛ پێشخڕ؛ پێشکڕ ‹محصول باغش را پیش‌خرید کرده‌اند: بەرهەمی باخەکەیان سەلەم کردووە›.

**پیشخوان** / pîšxān/ ☜ **پیشخان ـ١**

**پیشخور** / pîšxor/: اسم. بەرخۆر؛ پێش‌خۆر؛ سەوزەخۆر؛ شینخۆر ‹وقتی آزاد حقوق گرفت، نصفش را پیشخور کرده بود: کاتێک ئازاد مووچەی وەرگرت، نیوەی بەرخۆر کردبوو›.

**پیش‌دانشگاهی** [1] / pîšdānešgāhî/: اسم. ئاخر سالی خوێندنی ناوەندی بۆ کەسێک بیەوێ بچتە زانسگاوە.

**پیش‌دانشگاهی** [2]: صفت. سەبارەت یان سەر بە دەورانی پێش زانسگا.

**پیشداوری** / pîšdāvarî، ـها/: اسم. ١. پێشداوەری؛ بڕوا یا داوەری سەبارەت بە شتێک بەر لە وەدەست هێنانی ئاگاداری تەواو یا هەڵسەنگاندنی راستیەکانی ئەو شتە ‹آنچه در مورد آرام می‌گویی یک پیشداوری است، چون تو اصلا او را نمی‌شناسی: ئەو شتانەی لەمەڕ ئارامەوە دەڵێی پێشداوەریە، چونکە تۆ هەر نایناسی› ٢. ڕکە؛ دەمارگری؛ بەدگومانی یا وەرەزی بێ‌جێ سەبارەت بە دەستە، رەگەز یا دینێکی تایبەت.

**پیش‌دبستانی** / pîšdabestānî/: صفت. پێش‌سەرەتایی؛ سەبارەت بە پێشتر لە دەورانی سەرەتایی.

**پیش‌درآمد** / pîšdarāmad، ـها/: اسم. دەسپێک؛ دەستپێک: ١. پێشەکی؛ سەرەتا؛ یەکەم قۆناغی هەر کارێک ٢. [موسیقی] بەشێکی کورت کە لە سەرەتای ئاهەنگ یا بەرهەمێکی موسیقی لێ‌دەدرێ ‹درویش‌خان پیش‌درآمد را در موسیقی ایرانی وارد کرد: دەرویش‌خان دەسپێکی هێنایە ناو مۆسیقای ئێرانیەوە›.

**پیش‌درد** / pîšdard/: اسم. [پزشکی]

سۆڵــسوڵــێ؛ ژانــێ کــه لــه ڕەوتی زایینــدا دێت و دەڕوا و هێشتا تەواو نەیگرتووە.

**پیــشدستی / pîšdastî**/:اسم. پێشدەســتی: ١. /ـها/ دەوری؛ پێـشدەسـی؛ پشدەسـی ‹بدو یک پیشدستی بیاور: ڕاکـه پێشدەستییەک بێنـه› ٢. پێــشاوبڕکێ؛ کــار یــان ڕەوتی دەســپێکردن یان جێبەجێ کـردنی کارێـک بـەر لـه کـەس یان کەسانی‌تـر ‹مـن مـی‌خواستم بخرم، اما آرام پیشدستی کـرد: مـن ئـەمـەویـست بکـڕم، کـەچـی ئارام پێشدەستی کرد›.

**پیــشران / pîšrān**، ـها/:اسم.[صنعت] شـافت؛ مێـڵەیـەکـی کـانزایی کـە هێـزی مۆتـۆر دەگەیەنێتە شوێنانی‌تر.

**پیــــــشرس / pîšras**/: صـــــفت. زووڕەس؛ زووڕەسـه؛ زووگـەهیشتی؛ بـه تایبـەتمـەنـدی زوو پێگەییشتن یان باڵـغ بـوون بـەر لـه کـاتی ئاســایی خــۆی ‹کــودک پیــشرس: منالــی زووڕەس›.

**پــیش‌رســی / pîšrasî**/:اسم. ١. زووڕەســی؛ زووگـەهیـشتی؛ چۆنـاوچۆنی زوو پێگـەییـشتن ٢. زووتر له کاتی خۆی باڵغ بوون.

**پیــشرفت / pîšraft**، ـهـا/:اسم. پێــشڕەوت؛ پێــشکەتی: ١. پێــشڕەوی؛ کــار یــان ڕەوتی بـەرەو پـێش چـوون؛ زیـادکردن ‹دریا پیشرفت کـرده و بخـشی از سـاحل را فـرا گرفتـه اسـت: زەریـا پێـشڕەوی کـردووە و پـاژێ لـه وشـکی داگرتـووە› ٢. پێـشڕەفـت؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی هـەڵـدان؛ پێشکەوتن؛ پێشکەفتن ‹بـا ایـن کارهـا اقتـصاد مـا پیـشرفت نمـی‌کنـد: بـەم کارانـە ئـابووری ئێمـە پێشڕەوت ناکا›.

**پیــــشرفتگی / pîšraftegî**، ـهــــا/:اســــم. پێـشەوەچـوویی؛ بـەشـێ لـه شـتێ کـه بـەرەو پـێش کـشاوە ‹خلـیج پیـسرفتگی آب در خـشکی است: خەلیج پێشەوەچوویی ئاوە لە وشکانیدا›.

**پیــشرفته / pîšrafte**/: صـفت. پێــشکەوتــوو ‹کشور پیشرفته: وڵاتی پێشکەوتوو›.

**پیــشرو / pîšrow**، ـها؛ ـان/: صفت. پێـشڕەو: ١. لـه پـێش؛ پێـشەنـگ ‹دستەی پیشرو: دەسـتەی پێشەنگ› ٢. پێـشکەوتــن‌خــواز ‹اندیـشەی پیشرو: بیری پێشکەوتن‌خواز›.

**پیــشروی / pîšravî**، ـهـا/:اسم. پێـشڕەوی؛ کـار یــان ڕەوتی چوونــه بــەرەوە؛ بــزوانی بــەرەو پــێش یـان ڕووەو ئامـانج. بـەرانبـەر: **پَسرَوی** ‹به علت بسته شـدن جاده پیـشروی ممکـن نـشد: بـه هـۆی بـەسـترانی جـادەوە، پێـشڕەوی دەسـتی نەدا›.

**پــیش‌زاده / pîšzāde**، ـهــا؛ ـگــان/:اســم. ١. هەنەزا؛ هەنەزاگ؛ منداڵـی شـوو لـه ژنێکـی‌تـر ٢. کۆڵــەوەس؛ کۆڵــەبــەس؛ کۆڵـــوەس؛ کۆڵــوس؛ کۆڵــبەســت؛ منداڵــی ژن لــه مێردێکی‌تر.

**پــیش‌ســاخته / pîšsāxte**، ـهــا/: صــفت. دروسـت‌کـراو پـێش ئـەوەی داوا بکـرێ یـان پێش دانان لـه شـوێنی خـۆی (وەک دیـوار یـان پرد).

**پــیش‌سـری / pîšsarî**، ـهـا/:اسم. دەور سـەر؛ گێلگێلــــە؛ پێـــشانی؛ ڕیــــزە گوڵـــــینگەی تێک‌خراو بۆ سەر و شەدەی ژنان.

**پــیش‌سینه / pîšsîne**، ـهـا/:اسم. ١. بـەرۆک؛ ئەو بەشە لـه کـراس کـه سـنگ دادەپۆشـێ ٢. بەروانکە؛ سینگەبەند؛ سـینەبـەنـد؛ بـەرکـۆش؛ بەردەلک.

**پــیش‌شـرط / pîš.šart**، ـهـا/: [فارسـی/ عربـی] /اسم. پـێش‌مـەرج: ١. پـێش‌شـەرت؛ مـەرجـێ کە بەر لـه دەسـت پێکـردنی کارێـک دادەنـرێ ‹دولـت هـیچ پـیش‌شـرطی را بـرای آغـاز گفتگوهـا نمــی‌پــذیرد: دەوڵـــەت بـــۆ دەســـت پێکـــردنی وت‌وویژەکـان هـیچ پـێش‌مـەرجێـک ناپـەزێرێ› ٢. بـار و دۆخێـک کـە بـۆ پێکهـاتنی بـار و دۆخێکـی‌تـر پێویـستە ‹سرمایه، دانـش فنـی و

نیروی کار ماهر، پیش‌شرطهای توسعه اقتصادی است: سەرمایە، زانست و هێزی کاری کارامە، پێشمەرجەکانی گەشەی ئابوورین›.

**پیش‌شماره** / pîš.šomāre، ھا/:اسم. پێش‌ژمارە؛ کۆد ‹پیش‌شمارەی تلفن: پێش‌ژمارەی تەلەفوون›.

**پیش‌غذا** / pîšqazā، ھا/: [فارسی/ عربی]/اسم. بەرکول؛ بەردڵ؛ وەردڵ؛ بەرچێشتانە؛ خواردەمەنی سارد (وەک سالاد، نان و پەنیر و سەوزی، ماست و خەیار) کە بەر لە چێشت لە سەر سفرەوە دەیخۆن: **اُردُور**

**پیش‌فاکتور** / pîšfāktor، ھا/: [فارسی/ فرانسوی]/اسم. پروفورما.

**پیش‌فرض** / pîšfarz، ھا/: [فارسی/ عربی] /اسم. گریمانە؛ پێش‌گرە؛ ئەو ئەگەرەی کە لە پێشەوە بۆ کار یان دۆخێک ڕەچاوکرابێ ‹پیش‌فرض ما این بود که حاضران در جلسه تحصیلات دانشگاهی دارند: گریمانەی ئێمە ئەمە بوو کە ئامادە بوانی دانیشتنەکە خوێندنی بالایان هەیە›.

**پیش‌فروش** / pîšfurûš/:اسم. پێش‌فرۆش؛ فرۆشتنی شتێک پێشتر لەوە تەواو دروست بووبێ ‹همەی این خانەها پیش‌فروش شدە است: هەموو ئەم خانوویانە پێش‌فرۆش کراون›.

**پیش‌فنگ** / pîšfang/:اسم. [نظامی] پێش‌فەنگ؛ چەشنێک ڕاگرتنی چەک بە شێوەی ئەستوونی و لە بەر سنگ و بەرۆکەوە، بە نیشانەی ڕێزدانان ‹نگهبان دم‌در برایش پیش‌فنگ کرد: نگابانی بەر درگا پێش‌فەنگی کرد بۆی›.

**پیشقدم** / pîšqadam، ھا؛ ان/: [فارسی/ عربی]/اسم. پێشەنگاو؛ ڕچەشکێن ‹او همیشه در کارهای خیر پیشقدم بود: ئەو هەمیشە لە چاکەکردندا پێشەنگاو بوو›.

**پیشقراول** / pîšqarāvol، ھا؛ ان/: [فارسی/ ترکی]/اسم. دیدەوەر؛ پێش‌قەرەوڵ؛ سەیارە؛ پێشایی لەشکر.

**پیش‌قسط** / pîšqest، ھا/: [فارسی/ عربی] /اسم. پێشەکی؛ ئەو پارەیە کە بۆ کڕینی شتێک، بە نەختی و بەر لە دانەوەی قیستەکانی دەدرێ.

**پیشکار** / pîškār، ھا؛ ان/:اسم. پێشکار: ١. گزیر؛ بەردەست؛ کار بە دەستی خان و ئاغا ٢. پاکار؛ بەردەست؛ لێهاتووترین کرێکار لە کارگەیەکی سوننەتیدا کە لە کاتی نەبوونی وەستاکار، سەرپەرشتی بە ئەستۆوە ٣. کرێکاری نانەوایی کە نان لە تەنوورە دەردێنێ. هەروەها: **پیشکاری**

**پیشکرایه** / pîškerāye، ھا/: [فارسی از عربی] /اسم. پێش‌کرێ؛ پێش‌کرایە؛ پێش‌کراهە؛ ئەو کرێیە کە پێش لە بار یان مسافر بردن وەردەگیردرێ. بەرانبەر: **پسکرایه**

**پیش‌کسوت** / pîškesvat، ھا؛ ان/: [فارسی/ عربی] صفت. کۆنەکار؛ کارکوشتە لە کارێکدا ‹او از پیش‌کسوتهای کشتی است: ئەو لە کۆنەکارەکانی زۆرەبانیە›.

**پیشکش** / pîškeš، ھا/:اسم. پێشکەش؛ پێشکێش؛ دیاری؛ زەنگولنە.

**پیشکشی** / pîškešî، ھا/: صفت. پێشکەشی؛ پێشکێشی؛ خەلاتی؛ دیاری؛ بەخشراو لە لایەن کەسێکەوە؛ پێشکەش‌کراو ‹دندان اسب پیشکشی را نمی‌شمارند: ئەسپی پێشکەشی ددانی ناژمێرن›.

**پیشکی** / pîšakî/: صفت. [گفتاری] پێش؛ پێش لە کات؛ بەرین؛ بەرگین؛ وەڵین؛ لە بەرا ‹حرف پیشکی: وتەی بەرین›.

**پیشکی**: قید. [گفتاری] لە بەردا؛ لە بەرا؛ لە پێشدا؛ وەڵێنە ‹پیشکی پول پارچە را گرفت: لە بەرا پوولی پارچەکەی وەرگرت›.

**پیشگام** / pîšgām، ان/:اسم. پێشەنگاو؛

پێشەنگ؛ ئەوەی بەر لە خەڵکیتر کارێکی گرینگ دەکا ‹او در کار خیر همیشه پیشگام است: هەموو کات بۆ چاکە پێشەنگە›.

**پیشگاه** / pîšgāh/:اسم. دەرگانە؛ ئاسانە؛ بارەگا؛ پێشگا؛ بەردەم؛ پێش‌چاو؛ هەنتەش؛ پێش‌بەر؛ پێش‌چاقی؛ پێش‌چاف؛ بەرچاف؛ بەرچاو؛ وەرەچەم؛ بەردەمی کەس یان کۆمەڵی پایەبەرز ‹ما در پیشگاه ملت سوگند می‌خوریم: ئێمە لە پێشگای خەڵکدا سوێند دەخۆین›.

**پیش‌گزینی** / pîšgozînî، ـها/:اسم. بەربژاری؛ پێش‌هەڵچنی؛ پێش‌هەڵبژێری؛ کار یان ڕەوتی هەڵبژاردنی کەسێک یا شتێک لە پێشدا.

**پیشگفتار** / pîšgoftār، ـها/:اسم. پێشەکی؛ پێش‌وتار ‹پیش از مطالعه‌ی این فرهنگ، پیشگفتار آن را با دقت بخوانید: بەر لە خوێندنی ئەم فەرهەنگە، پێشەکییەکەی بە وردی بخوێننەوە›.

**پیشگفته** / pîšgofte/:اسم. پێش‌وتە؛ بەروتە ‹پیشگفته‌ی نامه‌ی ما یاد خدا بود: پێش‌وتەی نامەکەمان یادی خودا بوو›.

**پیشگفته**: ضمیر. ناوبراو؛ بێژراو؛ گوتراو؛ وتراو؛ واچیا؛ وشیا؛ لە پێشدا گوتراو ‹در مقاله‌ی پیشگفته در این باره بحث شده‌است: لە وتاری ناوبراودا لەمەڕ ئەم بابەتەوە باس کراوە›.

**پیشگو** / pîšgû، ـها؛ ـیان/:اسم. دوابین؛ یان؛ پێشگۆ؛ خەبەردەر لە ڕوونەداو ‹نمی‌دانستم پیشگو هم هستی: نەمدەزانی دوابینیشی›.

**پیشگویی** / pîšgûyî، ـها/:اسم. یانی؛ پێشگۆیی؛ دوابینی؛ کار یان ڕەوتی خەبەردان لە نەهاتوو.

**پیشگیری** / pîšgîrî، ـها/:اسم. بەرگری؛ پێشگری؛ بەرپێچ؛ کار یا چارەدۆزی بۆ بەر بە ڕووداوێک گرتن لە داهاتوودا ‹پیشگیری از بیماری؛ پیشگیری از سیل: بەرگری لە نەخۆشی؛ پێشگری لە لافاو›.

**پیش‌لرزه** / pîšlarze، ـها/:اسم. وردە لەرەکانی پێش بوومەلەرزە. بەرانبەر: **پس‌لرزه**

**پیشمانده** / pîšmānde، ـها/: صفت. بەرماو؛ پاشماوە ‹نخورد شیر پیش‌مانده‌ی سگ: شێر بەرماوی سەگ ناخوا›.

**پیشمرگ** / pîšmarg، ـها؛ ـان/:اسم. پێشمەرگە؛ گیان‌فیدا؛ کەسێک کە بۆ بەخت‌کردنی گیانی خۆی بۆ کەس یان کەسانی‌تر ئامادەیە.

▣ پیشمرگ شدن: لە بەر مردن؛ بوونە پێشمەرگە؛ گیان فدا کردن؛ بۆ کەس یان کەسانێک مردن ‹الاهی پیشمرگت بشوم: یاخودا لە بەرت مرم›.

**پی‌شناسی** / peyšenāsî/:اسم. دەمارناسی.

**پیشنماز** / pîšnamāz، ـها؛ ـان/:اسم. بەرنوێژ؛ پێش‌نوێژ؛ نڤێژبەر؛ ئیمام؛ وەرنما.

**پیش‌نویس** / pîšnevîs، ـها/:اسم. پێش‌نووس؛ چڵک‌نووس؛ ڕەش‌نووس؛ گەلالە؛ نووسراوەیەک کە هێشتا پێیدا نەچوونەتەوە و هەڵەگری نەکراوە.

**پیشنهاد** / pîšnahād, pîšnehād، ـها؛ ـات/:اسم. پێشنیار؛ پێشنیهاد؛ پێشنیاد؛ وتەیەک کە بۆ چارەسەری کارێک یان بۆ بیر لێ‌کردنەوە دەگوترێت.

**پیش‌نیاز** / pîšniyāz، ـها/:اسم. پێش‌نیاز؛ ئەوەی کە بۆ دەس پێ‌کردنی کارێک پێویستە.

**پیشوا** / pîšvā، ـها؛ ـیان/:اسم. پێشەوا؛ ڕێبەر؛ یەکمان؛ سەرەک هۆز ‹پیشوای ملّی؛ پیشوای دینی: پێشەوای نەتەوەیی؛ پێشەوای دینی›.

**پیشواز** / pîšvāz/: [فارسی از کردی] اسم. پێشواز؛ پیرایی؛ پیری؛ پێوەی؛ بەرەندک؛ بە

پیریـەوە چـوون ‹چند روز دیگر به پیشواز بهار می‌رویم: چـەن ڕۆژیتـر ئـەچینـە پیرایـی بەهارەوە›: **پیشباز**

**پیشواژه** / pîšvāje، ـها/: اسم. *[دستور]* پێشگر؛ بەشی یەکەمین و بە تەنیا مانادار لە وشەی لێکدراودا (وەکوو «گەورە» لە وشەی «گەورەماڵ»دا).

**پیشوند** / pîšvand، ـها/: اسم. *[دستور]* پێشبەند؛ پێشوەند؛ بەندێک کە لە سەرەتای وشەیەکەوە دێت (وەک «هاو» لە وشەی «هاوڕێ»دا پێشبەندە).

**پیشه**[1] / pîše، ـها/: اسم. *[ادبی]* پیشە: ١. کار؛ پێشە؛ ئیش؛ کاربەند؛ هەرمانە؛ گورە؛ گوروە؛ سنعات؛ کار و بار، بەتایبەت چالاکی هونەری یان دەستی ‹پیشەی آهنگری؛ پیشەی خیاطی: کاری ئاسنگەری؛ پیشەی دروومانی› ٢. هوکارە؛ شێوەی کار و ڕەفتارێک کە کەسێک خووی پێ‌گرتووە ‹قهر کردن را پیشەی خود ساخته است: تۆرانی کردۆتە پیشە›.

⊡ **پیشه کردن**: پیشەکردن؛ کردنە پیشە؛ گرتنە بەر ‹او مدتی روزنامه‌نویسی پیشه کرد: ئەو ماوەیەک ڕۆژنامەنووسی کردە پیشە›.

**ـ پیشه**[2]: *پیواژه.* ــ پیشە؛ ـکار؛ خاوەن پیشە ‹هنر پیشه؛ جفاپیشه: هونەرپیشە؛ جەفاکار›.

**پیشه‌ور** / pîševar، ـها؛ ـان/: اسم. پیشەوەر؛ سنعاتکار؛ دوکاندار: ١. کەسێک کە لە کارگەیەکی چکۆلە، بەتایبەت لە دوکانێکدا سەر بە خۆ کار دەکا ٢. پیشەسازێ کە بە دەست یان ئامرازێکی دەستی کار دەکا.

**پیشی** / pîšî، ـها/: اسم. بەر؛ دۆخ و چۆنیەتی لە پێشتر و لە بەرەوە بوون.

⊡ **پیشی گرفتن**: کەوتنە بەرەوە؛ کەوتنە پێشەوە؛ کەوتنە لای سەروو؛ بەرپێ لێ‌سەندن؛ پێش لێ‌گرتن؛ کەوتەی وەلێ؛ دانە بەر کەس یان کەسانیتردا ‹به زودی بر همه پیشی گرفت: خێرا کەوتە پیش هەموانەوە›.

**پیشی** / piši، ـها/: اسم. *[کودکانه]* پشە؛ پشی؛ پشێ؛ پشیلە؛ پشەکە؛ پشلێ؛ پشیلی؛ کتک؛ کتە؛ کتلێ.

**پیشین** / pîšîn/: صفت. ١. پێشین؛ لە مێژ؛ زوو؛ بەرگین؛ لکاو بە ڕابردووەوە ‹روزگار پیشین: ڕۆژگاری زوو› ٢. پێشوو؛ بەر؛ بەروو؛ بەرێ؛ وەرین ‹صندلیهای ردیف پیشین: کورسیەکانی ڕیزی بەرەوە›.

**پیشینه** / pîšîne، ـها/: اسم. پێشینە ‹دارای پیشینه‌ی کیفری: خاوەن پیشینەی جزیایی›.

**پیشینه‌دار** / pîšînedār، ـها؛ ـان/: صفت. پێشینەدار.

**پیشینیان** / pîšîniyān/: ضمیر. پێشینان؛ پێشینیان؛ ڕابردوان؛ ویەردێ ‹اندرز پیشینیان: پەندی پیشینان›.

**پیغال** / pîqāl/: اسم. ریتقە؛ ڕیخنە؛ ڕیتق؛ ڕینە؛ ڕێقنە؛ جیقنە؛ پێخە؛ گووی باڵندە.

**پیغام** / peyqām، ـها/: اسم. *[گفتاری]* پەیام؛ پەیغام؛ پێغەم؛ پێخەم؛ پێخام؛ وەلام؛ ولام؛ وەرام ‹پیغام شما رسید: پەیامەکەتان گەییشت›.

**پیغام ــ پسغام** / peyqāmpasqām، ـها/: اسم. *[تعریض]* وەڵام و بەلام؛ پەیغامی پەیتاپەیتا؛ پەیامی لەپەستا ‹من دیگر از دست پیغام‌ـپسغام تو خسته شدم: من ئیتر ئەم وەلام و بەلامەی تۆ وەڕەزی کردم›: **پیغام و پسغام**

**پیغام‌وپسغام** / peyqām-o-pasqām / ☜ **پیغام ـ پسغام**

**پیغمبر** / peyqambar، ـها؛ ـان/: اسم. ڕاسپاردە؛ نێردراو؛ نێردراوە؛ کەسێ کە خۆی بە نێردراوی خودا بزانێ و

ئامۆژگاریگـەلێـک بـەنـاو داخـوازی و فـەرمانکـاری خـواوە بـە خـەڵـک بـدا: ١. پێغـەمبـەر؛ پێغـەمـەر؛ پـەیغـەمبـەر؛ پـەیخـەمـەر؛ پـەیخـەمبـەر؛ راسـپاردەی خـوا ٢. حـەزرەتی موحـەمـەد؛ پێغەمبەری ئیسلام * **پیام‌آور**

**پیغمبـری** / peyqambarî/: *اسم.* پێغـەمبـەری؛ پێخەمبـەرایـەتی؛ پـەیخـەمبـەریـەتی؛ کـار یـا پلەوپایەی پێغەمەر.

**پیف** / pîf/: *صوت.* پیـف؛ پـف؛ یـەع؛ نیشانەی وەڕەزی بە تایبەت لـە بـۆنی نـاخۆش ‹پف چه بویی!: پف چ بۆنێک!›.

**پیـک** / peyk، هـا/: *اسم.* پـەیـک؛ پیـک؛ پۆستەچی؛ نامەبـەر؛ خـەبـەربـەر؛ کـەسـێ کـە نامـە یـان پـەیامێـک لـە شـوێنێکەوە بـۆ شـوێنێکیتـر یـان لـە لایـەن کـەسێکەوە بـۆ کەسێکیتـری دەبـا ‹لطفاً کتاب را با یک پیک بفرستید: تکایە کتێبەکە بە پەیکێکدا بنێرن›.

**پیـک** / pîk/: [فرانسوی]/*اسم.* پیـک؛ خاڵـی وەرەق بـە وێنـەی دڵـێکی پێچـەوانـە و دەستەدار: **گلابی**

**پیکـاپ** / pîkāp، هـا/: [انگلیسی]/*اسم.* وەرگـر؛ ئامێرێـک بـۆ گـۆڕانی جوولـەی میکـانیکی بـە لـەرەی کـارەبـایی و پێـک هێنـانی دەنـگ (وەک وەرگری گرام، ڕادیۆ یا تەلەفیزیون).

**پیکـار** / peykār، هـا/: *اسم. [ادبی]* پـەیکـار؛ خـەبـات؛ شـەڕ و جـەنگ؛کێشە و هـەرا؛ بەربەرەکـانێ؛ مـلملانـێ؛ چنگـەپرچـێ ‹پیکار با بیسوادی: شەڕ لەگەڵ نەخوێندەواری›.

▣ پیکـارکردن: شـەڕکـردن؛ بـە شـەڕ هـاتن؛ گژیەی؛ بەربەرەکانێ کردن.

**پیکـارجو** / peykārcû، یـان/: *صفت. [ادبی]* شـەڕڤـان؛ خـەباتگێـڕ؛ جـەنگـەران؛ شـەڕکـەر؛ شۆڕشگێڕ: **پیکارگر**

**پیکارگر** / peykārgar/ ☜ **پیکارجو**

**پیکان** / peykān، هـا/: *اسم.* پـەیکـان؛ پێکـان: ١. تـیر؛ تـیری کـەوان؛ تـیرێ کـە بـە کـەوان دەیهـاوێن ٢. سـەرەتـیر ٣. فلـیش؛ نیشانەیـەک بـەم وێنـەیـە (←) کـە زۆرتـر بـۆ پیشاندانی شـوێن و لا بـەکـار دەبـرێ: **پیکانـە؛ فلش**

**پیکانه** / peykāne/ ☜ **پیکان ـ٣**

**پیکر** [١] / peykar، ها/: *اسم.* پـەیکـەر؛ هـەیکـەل؛ قەلافەت؛ لـەش؛ کـەلـەش؛ کـەلـەخ؛ کـەڤـاڵ؛ کەلەستە؛ گـۆدە؛ گۆڤـدە؛ تـەن؛ سـۆ؛ بـەچـک؛ تووز؛ جەستەی گیانـدار بـەتایبـەت مـرۆ ‹پیکر بی‌جانش روی خاک افتاده بود: لاشـەی بـێ‌گیـانی کەوتبووە سەر خاکەوە›.

**ـ پیکر** [٢] / ـها؛ ـان/: *پیواژە.* ـپـەیکـەر؛ بـە تـەن و پێکهاتەی دیار ‹پری‌پیکر: پەری‌پەیکەر›.

**پیکربنـدی** / peykarbandî، هـا/: *اسم.* پـەیکـەربـەنـدی؛ سـەقـامگیری؛ چۆنیـەتی جـێگیر بـوونی پاژگـەلی کـەرەسـە یـان دەزگایەک دەپاڵ یەکدا.

**پیکرتـراش** / peykartarāš، هـا؛ ـان/: *اسم.* هەیکەڵتراش؛ پەیکەرچێکـەر؛ پـەیکـەرتـراش؛ پەیکەرتاش؛ کۆتەڵتاش؛ کەسـێ کـە پـەیکـەر دروست دەکا.

**پیکرتراشـی** / peykartarāšî، هـا/: *اسم.* هەیکەڵتراشی؛ پەیکەرتاشی؛ کۆتەڵتاشی.

**پیکـره** / peykare، هـا/: *اسم.* ١. پـەیکـەر؛ هەیکەل؛ بـەرهـەمێکـی دروستکـراو، تاشـراو یـان هـەڵـکەنـدراوی شـتێک یـان کـەسـێک ‹پیکـرەی آهـو: پـەیکـەری ئاسـک› ٢. ڕێـژەک؛ چوارچێـوە؛ ڕێـز ‹پیکـرەی ساختمان: ڕێـزەکـی بینا›.

**پیکلو** / pîkolo/: [ایتالیایی] ☜ **پیکُولو**

**پیـک‌نیـک** / pîknîk، هـا/: [فرانسوی]/*اسم.* سـەیـران؛ گـەشـت؛ هـەلفۆنـە؛ کـار و ڕەوتی چوونـە دەرەوەی بـە کۆمـەڵ بـۆ حـەسـانەوە و

خۆشی.

**پیکولو** / pîkolo، ـھا/: [ایتالیایی]/اسم. پیکولۆ؛ پیک؛ فیقەنە؛ فیقەلە؛ چکۆلەترین سازی بایی لە چەشنی شمشاڵ: **پیکڵۆ**

**پیگرد** / peygard، ـھا/: /اسم. شوێنگری؛ پەیگری؛ دواگەڕی؛ پەیگەڕی؛ کار یان ڕەوتی شوێنگرتنی کارێک یان گەڕان لە دووی کەسێک بۆ ڕوون بوونەوەی ڕاستی ڕووداوێک.

⊡ زیر پیگرد بودن: لە ژێر چاوەدێریدا بوون.

**پیگمه** / pîgme، ـھا/: [فرانسوی]/اسم. پیگمە: ١. خەڵکی کورتە باڵای ئەفریقا تا گینەی نوێ کە باڵایان کەمتر لە ١,٥ میترە و ڕەنگیان ڕەش و لێویان ئەستوور و لەشیان زۆر کەمتووک و سەریان قژنە ٢. /مجازی/ بەگە؛ باواقوت؛ باواقۆرەت؛ بالابست؛ چڵەنۆک؛ گونەڵ؛ باواعەمرە.

**پیگیر** / peygîr/: صفت. گەڕیانۆخ؛ شوێنگێڕ؛ پەیجۆر؛ پەیگێڵ؛ دواگەڕ؛ دەرەدوا؛ خاوەن تایبەمەندی و توانی شوێنگری.

⊡ پیگیر بودن: شوێنگر بوون؛ شێلگیر بوون؛ پێداگر بوون؛ پێداگەڕ بوون؛ دواگەڕ بوون؛ شوێنداگەڕ بوون؛ بە دوادا چوون؛ لە پەستا یا بۆ ماوەیەکی زۆر شوێن کارێک کەوتن بۆ گەییشتن بە ئاکامی ‹او در زمینەی موسیقی خیلی پیگیر است و مرتب تمرین می‌کند: ئەو لە بواری مۆسیقادا زۆر شوێنگرە و هەر خەریکە›.

پیگیر شدن: پەیگیر بوون؛ شوێنگر بوون؛ بە پێ و شوێنەوە چوون.

**پیگیری** / peygîrî، ـھا/: /اسم. شوێنگری؛ شوێنگیری؛ وەدواکەوی؛ دانەدوویی؛ شوێنکەوی؛ وەدووکەوی؛ بنگیری؛ وێکەوی؛ کاری دوا کەوتن و لێکۆڵینەوە؛ کار یان ڕەوتی دانەپەی؛ درێژە پێدان بە کارێک بۆ ماوەیەکی زۆر (بەتایبەت تا بەدەست هێنانی ئاکام) ‹از او خواستم کار را پیگیری کند: داوام لێکرد شوێنگری کارەکە بکا›.

**پیل** / pîl، ـھا/: /اسم. پیل: ١. [هندی] /ـھا؛ ان/ /ادبی/ فیل؛ فێل؛ پێل ٢. [فرانسوی] قوە؛ پێل؛ باتری؛ ئامرازێک بۆ وەدەست هێنانی گەڕیانی کارەبایی ڕاستەوخۆ لە وزەی کیمیایی، گەرمایی، ناوەکی یا خۆریدا.

⊡ پیل آفتابی: پێلی هەتاوی؛ ئامرازێک کە وزەی هەتاوی بکاتە وزەی کارەبایی: **پیل خورشیدی**

پیل خورشیدی ☜ **پیل آفتابی**

**پیل آسا** / pîlāsā, -'āsā/: [هندی/ فارسی] صفت. /ادبی/ فیلەتەن؛ فیل‌ئاسا؛ لەرمان؛ پێلسان؛ وەک فیل یەکجار لەش قەوی.

**پیل افکن** / pîlafkan, pîl'afkan/: [هندی/ فارسی] صفت. /مجازی/ شێرکوژ؛ شێرکورۆژ؛ یەکجار زۆردار.

**پیلبان** / pîlbān/: [هندی/ فارسی]/اسم. /ادبی/ فیلەوان؛ فێڵەوان.

**پیلپایی** / pîlpāyî/: [هندی/ فارسی] ☜ **داءُالفیل**

**پیل پیکر** / pîlpeykar/: [هندی/ فارسی] ☜ **پیل‌تَن**

**پیل تن** / pîltan/: [هندی/ فارسی] صفت. /ادبی/ بەخۆوە؛ چوارشانە: **پیل‌پیکر**

**پیلوت** / pîlot، ـھا/: [انگلیسی]/اسم. ١. شەمعەک؛ مۆمک ٢. پیلوت؛ یەکەم قاتی بینا کە بۆ پارکینگ، مۆتۆرخانە و ... دروست کراوە.

**پیلـه** / pîle/: *اسم.* ۱. /ـها/ کـەلـوو؛ تـەتـڵە؛ تەتڵەمیوە؛ پێـڵە ‹پیلـەی کـرم ابریـشم: تـەتـڵووی کرمـی ئاوریـشم› ۲. ڕێـش؛ بریـنـێ کـە چـڵکی کردووە و چڵ دەدا ۳. /ـها/ *[قـدیمی]* هـەگبـە؛ ویلـۆ؛ تـووربێن؛ خـورج؛ خـورجین؛ تیـوەرە؛ تـۆرەکـە؛ تـووەرە؛ تۆمـەرە؛ تۆمـۆرە؛ تـوورەکـە؛ تۆراخ؛ توورەکەیـەکـی کـەم تـا کورتێـک درێـژ کـە چـەرچـی بـە شـانیدا دەدا و شـتومـەکی پێ‌هەڵدەگرت.

▣ پیلەی ابریشم: تـەتـڵەمیـوە؛ ماشـۆت؛ کلافـە ئاوریشمی خۆرست و دەست لێ‌نەدراو.

▣ پیلـه کـردن: ۱. زووخ هێنـان؛ چـڵـک کـردن؛ لـووکردنی بـرین ۲. *[مجـازی]* کەسێـک هـەڵـپێچاندن ‹این قدر به مادرت پیله نکن: ئەوەندە لە دایکت هەڵمەپێچە›.

**پیلـەدوزی** / pîledûzî، ـها/: *اسم.* ماشـۆتچـنی؛ جـۆرێ دروومـان لـە تـەتـڵەی ئاوریشم.

**پیلـەوَر** / pîlevar، ـها؛ ـان/: *اسم.* دێـوەرە؛ دیقەرە؛ چەرچـی؛ کۆڵـگەڕ؛ کۆڵـگێڕ؛ پیلـەوەر؛ وردەواڵەفرۆش؛ گـەڕیدە؛ مـەترەباز؛ حـەتار؛ چـارپێچی؛ دەسـفرۆش؛ بـەخـەڵفـرۆش؛ وردەفـرۆش؛ دەزگـیر؛ دەسـتگێر؛ مامـەڵـەچـی گەڕیدە کە شتومەک دەباتە لادێیان.

**پیلـەوَری** / pîlevarî/: *اسم.* دێـوەرەیـی؛ چـەرچیـەتی؛ وردەواڵـەفرۆشـی؛ دەستفرۆشی.

**پیلی** / pîlî/ ☜ **پلی**

**پیلی ـ پیلـی** / pîlîpîlî/: *اسم. [گفتاری]* لـەتـر؛ ڕەتـڵ؛ سەرە لەتر؛ لارەلار؛ لـورەلـور؛ لـۆژەلـۆژ؛ دارەدار؛ بـەم لاو بـەو لادا کـەوتـن؛ ڕۆیـشتنی بە شلەپەتەیی.

▣ پیلـی ـ پیلـی خـوردن: لـەتـردان؛ ڕەتـەڵ بردنـەوە؛ لـەتـرێ پێکـەی ‹فلانـی از مـستی پیلی پیلی می‌خورد: فـلانی لـەبـەر مەسـتی لـەتـر دەدا›.

پیلی ـ پیلـی رفـتن: ڕەت لێـدان؛ شـلەپـەتـە ڕۆیین.

**ـ پیما** / peymā/: *پیواژە.* ـگـەڕ؛ ـ پێـو؛ ـگـێڵ؛ ـ پیم ‹فضاپیما: ئاسمانگەڕ›.

**ـ پیمائی** / peymā'î/ ☜ **ـ پیمایی**

**پیمـان** / peymān، ـها/: *اسم.* پـەیمـان؛ پـەیمانـە: ۱. هـەڤـبەسـت؛ شـۆن؛ ئـەمـەگ؛ قـەول؛ بـەڵـێن؛ شـەرت؛ تـەی؛ سـۆز؛ گفـت؛ بـەخـت؛ گفتـە؛ سـامە؛ قـەرار؛ کـار یـان ڕەوتی پێکهـاتنی دوو یـا چـەنـد لایـەن بـۆ جێبـەجـێ‌کـردنی کارێـک ۲. بریارنامە؛ پەیماننامە.

▣ پیمان اتحاد: پەیمانی یـەکیـەتی؛ پـەیمـانی یەکگرتوویی.

پیمان دفاعی: پەیمـانی بـەرگـری؛ پـەیمـانی بەرەڤانی؛ بەڵـێنی دوو یـا چـەنـد لایـەن بـۆ پشتیوانی‌کـردن لـە یـەکتـر ئـەگـەر دوژمـن هاتە سەر یەکێکیان.

پیمـان دوسـتی: پـەیمـانی دۆسـتایەتی؛ پەیمانی برایەتی.

پیمان صلح: پەیمانی ئاشتی.

پیمان نظامی: پەیمانی لـەشـکری؛ پـەیمـانی چەکداری. هەروەها: **پیمان اقتصادی**

▣ پیمان بستن: پەیمان بەستن؛ سۆزدان.

پیمـان شکـستن: پـەیمـان شـکاندن؛ هلشاندن.

**پیمـانشـکن** / peymānšekan، ـان/: *صفت.* پـەیمـانشـکێن؛ بـێ‌بـەڵـێن؛ بـێ‌بـەخـت؛ بـێ‌ئامـان؛ بـەدقـەوڵ؛ بـێ‌قـەوڵ؛ بـێ‌شـەرت و بـەقـا؛ خـاوەن ئاکـاری پێچـەوانـە لـەمـەڕ پەیمانێ کە بەستوویە.

**پیمـانشـکنی** / peymānšekanî، ـها/: *اسم.* پـەیمـانشـکێنی؛ پـەیمـانمـاڕی؛ کـار یـان ڕەوتی لـە ژێـر بـەڵـێن دەرچـوون یـان بـە

پێچەوانەی بەڵێن جوولانەوە.

**پیمانکار** / peymānkār، ـھا؛ ـان/: اسم. پەیمانکار؛ پەیڤدار.

**پیمانکاری** / peymānkārî/: اسم. پەیمانکاری: ١. کاری پەیمانکار ٢. ـها/ بنکە یان شوێنی ئەو کارە.

**پیمان‌نامه** / peymān.nāme، ـها/: اسم. پەیمان‌نامە؛ بڕیارنامە؛ بەڵگەیەک کە تێیدا چەند لایەن جێبەجێکردنی کارێکیان بەڵێن داوە.

**پیمانه** / peymāne، ـها/: اسم. ١. پێوانە؛ پەیمانە؛ پێوەر؛ ئەنگارە؛ کەوچ؛ کیلە؛ میهەنگ؛ ئەیارە؛ ئایەرە؛ پیاڵە یان کاسەیەک بۆ پێوان ‹یک پیمانه شیر؛ دو پیمانه آرد: پێوانەیەک شیر؛ دوو پێوانە ئارد› ٢. [ادبی] جام؛ پیاڵەی شەراو.

**پیمانی** / peymānî، ـها/: صفت. پەیمانی؛ بڕیاری: ١. سەر بە بڕیار یا بڕیارنامە ٢. دامەزراو بە مەرج ‹کارمند پیمانی: مووچەخۆری پەیمانی›.

**- پیمایی** / peymāyî/: پیوازه. ـگەڕی؛ ـ پێوی؛ پێوان؛ پیمەی؛ بڕین ‹راه‌پیمایی: ڕێپێوی›: **- پیمائی**

**پیمبر** / payambar, payombar، ـها؛ ـان/: اسم. [مخفف] ١. پێغەمبەر؛ پەیخەمبەر؛ ڕاسپاردەی خوا؛ پەیغەمبەر؛ پەیخەمەر؛ پێغەمەر ٢. حەزرەتی موحەمەد؛ پێغەمبەری ئیسلام. هەروەها: **پیمبری**

**پیمودن** / peymûdan/: مصدر. متعدی. [ادبی] //**پیمودی**: پێوات؛ **می‌پیمایی**: دەپێوی؛ **بپیمای**: بپێوە// ١. ڕۆیشتن؛ پێوان؛ پیمەی؛ پیمای؛ ڕانەلوەی؛ ڕێگایەک چوون ‹هنوز چند قدمی نپیموده بودیم کە... : هێشتا چەند هەنگاو نەڕۆیشتبووین کە...› ٢. [نامتداول] ئەندازەگرتن؛ پێوان (بەتایبەت بۆ تراو) ٣. هەڵقۆڕاندن؛ هەڵقوراندن؛ خواردنەوە ‹بادە پیمودن: شەراو خواردنەوە›. هەروەها: **پیمودنی**

■ صفت فاعلی: **پیماینده** (ـ)/ صفت مفعولی: **پیموده** (پێواو)/ مصدر منفی: **نَپیمودن** (نەپێوان)

**پینک‌پنگ** / pînkpong/: [انگلیسی] ☜ **پینگ‌پنگ**

**پینکی** / pînakî/: اسم. بیرەوخەو؛ خەونووچکە؛ خەوەنووچکە؛ خەوەکوتکێ؛ سووکەڵەخەو؛ بۆرژان؛ پۆنژین؛ ویژینگ؛ وەنەوزەکوتێ؛ خاوێر؛ خلماش؛ وەنەوز؛ چۆرت؛ غەوغەوە؛ سەرخەو؛ بارینە؛ نوقرشک؛ نوقورشک؛ پینەک؛ پینۆک؛ ورین؛ سرکەڵەخەو؛ قنگەخەو؛ قنەخەو؛ عنەوەنەوزە؛ کار یان ڕەوتی خەو بردنەوە بە دانیشتویی یان بە پاوە، بە شێوەیەک کە لە سەر یەک سەر دادەکەوێ و کەسەکە ڕادەچڵەکێ.

◘ پینکی رفتن: وەنەوز بردنەوە؛ چۆرت دان؛ وەنەوزدان؛ خەونووچکە بردنەوە.

**پینگ‌پنگ** / pîngpong/: [انگلیسی] اسم. پینگ‌پۆنگ؛ تۆپێنی سەر مێز: **پینک‌پینگ**

**پی‌نوشت** / peynevešt، ـها/: اسم. ژێرنووس؛ پەراوێز: ١. فەرمان یا بیر و ڕایەک کە لە پەراوێزی نامەی ئیداریدا دەنووسرێ ٢. دوانووس؛ بابەتێک کە پاش بڕوانامە، وتار یا کتێبێک پێی زیاد دەکرێ.

**پینه** / pîne، ـها/: اسم. پینە: ١. پنوو؛ پنی؛ پارچەیەک کە بە سەر دڕاویدا دەیدروون ٢. پۆڕگ؛ پۆلکە؛ گوڕاو؛ پینەی دەست؛ توێخێکی سەخت و ڕەق‌هەڵگەڕاو کە بە هۆی کاری زۆر لە بەری دەست و پێ و ئەژنۆ یان

مەچەکەوە پێک دێ.

⊡ پینە بستن: پینە هەڵگردن؛ ترەک بەستن؛ کونجر-کونجر بوون؛ زبر و زوور بوون؛ ئاژ بەستن؛ گوڕاوکەنن؛ درز هەڵدان ‹دستهایش از فرط کار کردن پینە بستە بود: هەر دوو دەستی لەبەر کاری زۆر پینەی هەڵگرتبوو›.

**پینەدوز** / pînedûz، ـها؛ ـان/: *اسم.* پینەچی؛ پینەدۆز؛ مشەقە؛ شەکیلی.

**پینەدوزی** / pînedûzî/: *اسم.* پینەدۆزی: ١. کۆشکاری؛ پینەدۆزی ٢. /ـها/ دووکانی پینەچی.

**پیواژە** / peyvāje، ـها/: *اسم. [دستور]* پاشگر؛ دوابەشی واتاداری وشەی لێکدراو (وەک وشەی «یار» لە «زانیار»دا).

**پیورە** / piyore/: [فرانسوی] *اسم.* شارێز؛ نەخۆشینێ کە دەبێتە هۆی چلک کردن و پەنەمین و کزانەوەی پدوو (هاروو).

**پیوست** / peyvast، ـها/: *اسم.* پەیوەست؛ پەیوەس: ١. ئەوەی کە بەستراوە بە شتێکی ترەوە ‹این نامە پیوست هم دارد: ئەم نامەیە پەیوەستیشی هەیە› ٢. یادداشتێک کە لە کۆتایی کتێب یان وتارێکەوە بۆ پاراو کردنی دێت ‹پیوست کتاب شامل کتابنامە و متن اسناد است: پەیوەستی کتێب بریەتیە لە پەرتووکنامە و دەقی بەڵگەکان›.

⊡ پیوست بودن: ڕەگەڵ بوون؛ پەیوەست بوون؛ پەیوەس بیەی ‹فتوکپی شناسنامە نیز پیوست تقاضانامە است: کۆپی ناسنامەکەش ڕەگەڵ داواکاریەکەیە›. هەروەها: **پیوست شدن؛ پیوست کردن**

**پیوستار** / peyvastār/: *اسم. [فلسفە]* پەیوەستار؛ ئەوەی کە درێژەدارە و هیچ بەشێکی بێ بەشەکانیتر دیاری ناکرێ.

**پیوستگی** / peyvastegî، ـها/: *اسم.* پێکەوە لکاوی؛ پەیوەستەیی؛ پێکەوە نووساوی.

**پیوستن** / peyvastan/: *مصدر. لازم. متعدی.* //**پیوستید**: یەکتان گرت؛ **می‌پیوندید**: یەک دەگرن؛ **بپیوندید**: یەک بگرن (ئەم چاوگە زۆرتر بە شێوەی کۆ دەگوترێ)// ◻*لازم.* ١. یەک گرتن؛ یەک گرتنەوە؛ هاوڕێ بوون؛ وێک کەوتن؛ یۆگێرتەی؛ یەکگری یان بوونەیەکی دوو یان چەند شت ‹در آنجا بە دوستانش پیوست: لەوێ لەگەڵ دۆستەکانی یەکیان گرتەوە› ◻ *متعدی.* ٢. لکاندنەوە؛ پێوە بەستن؛ هاوڕێ کردن یان یەککردنەوەی دوو یان چەند شتی لێکجیا ‹بە کمک چسب قطعەهای شکستە را بە هم پیوست: بە چەسب لەتە شکاوەکانی لکاندەوە›.

هەروەها: **پیوستنی**

■ صفت مفعولی: **پیوستە** (یەکگرتوو)/ مصدر منفی: **نپیوستن** (یەک نەگرتن)

**پیوستە**[1] / peyvaste/: *صفت.* یەکگرتوو؛ بەردەوام؛ بێ‌نێوبڕ؛ نەبڕی ‹عضو پیوستە: ئەندامی بەردەوام›.

**پیوستە**[2]: *قید.* ١. هەمیشە؛ بێ‌پسانەوە؛ لە سەر یەک ‹پیوستە دلت شاد و لبت خندان باد: هەمیشە دڵت شاد و لێوت بە پێکەنین بێ› ٢. شەقانشەق؛ سەرانسەر؛ لێکدا_لێکدا؛ پەیتا_پەیتا؛ لەپەستا؛ پەسای‌پەس؛ بەبەردەوامی ‹پیوستە طلبکاری می‌کرد: لە پەستا تەرزەی دەکرد›.

**پیوستەسبز** / peyvastesabz/ ☞ **همیشەسبز**

**پیوستەکار** / peyvastekār/: *صفت.* دایمەکار؛ خاوەن پیشەی تەواو کات.

**پیوستەگلبرگ** / peyvastegolbarg، ـها؛ ـان/: *صفت.* پەڕک پەیوەست؛ گوڵێ کە پەڕەکانی پێکەوە لکاون. بەرانبەر:

جداگلبرگ

**پیوند** / peyvand، ـها/: /اسم. پەیوەند؛ پێوەند؛ پێوەن: ١. پەیوەستی دوو یا چەند شت بە یەکەوە ‹در محل پیوند دو قطعە، شکستگی کوچکی دیدە می‌شود: لە شوێنی پەیوەندی دوو تیکەکەدا، شکاویەکی چکۆلە دەبینرێ› ٢. نێوانی خۆش ‹پیوند دوستی: پەیوەندی دۆستایەتی› ٣. *[کشاورزی]* تووز؛ موتربە؛ موتوربە؛ موتورفە؛ تام؛ لوولی؛ کار یا ڕەوتی تاماندن؛ چەسپاندنی لقێ لە گیا یان دارێک بە ئەندامی گیا یان دارێکی ترەوە بۆ باشترکردن یان زۆرتر بوونەوەی ‹پیوند درخت: پەیوەندی دار› ٤. *[پزشکی]* کار یا ڕەوتی لابردنی ئەندامی نەخۆش و دانانی ئەندامی ساق لە جێگەی بە برینکاری ‹پیوند کلیە: پەیوەندی گورچیلە› ٥. *[شیمی]* چۆنیەتی لکانی ئەتومگەل و دروست بوونی مولوکوول ‹پیوند داتیو: پەیوەندی داتیو›.

▣ **پیوند اسکنە**: *[کشاورزی]* ئەسکەنەپەیوەند؛ پەیوەندێ کە قۆتەی دار هەندێک دەتلیشێنن و لقە پێوەندیەکەی لە نێو دادەنێن: **پیوند شکافی**

پیوند زناشویی: پەیوەندی ژن و شوویی.

پیوند شکافی ☜ **پیونداسکنە**

**پیوند قلب**: *[پزشکی]* پەیوەندی دڵ؛ لابردنی دڵی نەخۆش و دانانی دڵێکی ساق لە جێگەی.

**پیوند لولەیی**: *[کشاورزی]* چووزەپێوەند؛ لوولەپێوەند؛ جۆرێ پێوەند کە پێستی سەری پەیوەندەکە بە وەچێکەوە، وەک لوولە دەردێنن و بە سەر چڵی پێوەندیەوە دەیچەسپێنن.

**پیوند لولەیی**: *[کشاورزی]* لاپێوەن؛ پەیوەندێ کە تۆکڵی دوو جێ لە لقی پێوەندی هەڵدەکەنن و بە یەکەوە شەتەکیان دەدەن تا پێکەوە دەنووسن.

▣ پیوند زدن: تووزکردن؛ متوربەکردن؛ پەیوەندکردن؛ پەیوەند دان؛ تاماندن؛ لوول‌دان؛ بەستنی شتێک بە شتێکی ترەوە بە جۆرێ کە پێیەوە بلکێت ‹پیوند زدن گل؛ پیوند زدن کلیە: پەیوەند دانی گول؛ پەیوەند کردنی ولک›.

پیوند یافتن: پێکەوە لکان؛ پێکەوە نووسان؛ پەیوەندگرتن.

**پیوندگاه** / peyvandgāh، ـها/: /اسم. پەیوەندگا؛ پێوەنگا؛ جێ‌لکان؛ شوێنی پێکەوە لکانی دوو یا چەن شت.

**پیوندگاهی** / peyvandgāhî/: *صفت*. پەیوەندگایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە پێوەندگاوە.

**پیوندی** / peyvandî، ـها/: *صفت*. پەیوەندی: ١. سەر بە پێوەند ‹بافت پیوندی: چنی پیوەندی› ٢. تاماندی؛ پێوەندکراو؛ موتوربەکراو ‹سیب پیوندی: سێوی پەیوەندی›.

**پی. وی. سی** / pî.vî.cî./: [انگلیسی]/اسم. *[مخفف]* پولی‌ڤینیل‌کلۆراید؛ بەرهەمێکی نەوتیە، زۆرێ لە پێویستیەکانی ژیانی ئەورۆی لێ دروست دەبێ.

**پیە** / pîh/: /اسم. پی؛ پیە؛ پیڤ: ١. دووگ؛ گوهن؛ پیو؛ دینگ؛ زوهم؛ پیم؛ وەز؛ بز؛ بەز؛ چەورایی بەز ٢. *[مجازی]* قەڵەوی؛ چاخی.

▣ پیە برنو ☜ درخت پیە، **درخت**

▣ پیە چیزی را بە تن خود مالیدن: *[کنایی]* خۆ بۆ هەموو شتێک دانان؛ سەر بۆ شکاندن ‹وقتی در تظاهرات شرکت کرد، پیە همە چیز را بە تنش مالیدە بود: کاتێ لە خۆپیشاندانەکەدا بەشداری کرد، خۆی بۆ هەموو شتێکی دانا›.

**پیەسوز** / pîhsûz/ ☜ چراغ پیەسوز، **چراغ**

# ت

ت / t/: حرف. ت؛ چوارەمین پیتی ئەلف و بێتکەی فارسی.

ت / te/: اسم. ۱. ناوی پیتی چوارەمی ئەلف و بێ زمانی فارسی ۲. [فرانسوی] تەی؛ تێ؛ ئامرازێکە بۆ شۆردن و خاوێن کردنەوەی سەر موزاییک و... ‹دو بار ت کشیدم اما تمیز نمی‌شود: دوو جار تەیم کێشا، بەلام خاوێن نابێتەوە›.

◙ ت گرد: تێی عەرەبی کە بەم شێوە: «ة» دەنووسرێت.

ـت / at/: ضمیر. ـت: ۱. ـەت؛ کەت؛ کێت؛ ـ ئەکەت؛ ـ ئەکێت؛ جێناوی خاوەنیەتی لکاو بۆ دووهەم کەسی تاک ‹کلاهت روی میز است: کلاوەکەت لە سەر مێزەکەیە› ۲. ـ ی؛ جێناوی بەرکاری لکاو بۆ دووهەم کەسی تاک ‹کجا بردندت؟: بۆ کوێیان بردی›.

تا / tā/: اسم. تا: ۱. نێوی عەرەبی چوارەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی ۲. لف؛ جفت؛ لنگ؛ لنگە؛ لۆ؛ لا؛ ئەندامی هاوچەشنی کۆمەڵێک ‹لنگه تا: تاوەتا› ۳. دەق؛ قەد؛ لۆ؛ لا ‹هنوز تای پارچه را باز نکرده است: هێشتا دەقی پارچەکەی نەکردۆتەوە› ٤. تایلە؛ تەیلێ؛ درەختێکی بەرز و بەردارە کە وەچەکەی بۆ دەرمان دەشێ.

◙ تا خوردن: قەد خواردن؛ دەق خواردن؛ تا خواردن؛ نووشتانەوە؛ دانووشتان؛ لۆ واردەی ‹لبه‌ی کاغذ تا خورده است: لێواری کاغەزەکە قەدی خواردووە›.

تا زدن: دەق کردن؛ قەدکردن؛ نووشتاندنەوە؛ دانووشتاندن؛ هەڵدانەوە؛ داموچاندن ‹سر آستین پیراهنت را تا بزن: سەرقۆلی کراسەکەت دەق کە›.

تا شدن: تا بوون: ۱. دەق بوون؛ دەق خواردن؛ قەد بوون؛ دەق دران؛ قەد کران؛ نووچان؛ دانووشتان؛ قولزین؛ نوێریایوە ‹لبه‌ی عکس تا شده بود: لێواری وێنەکە قەد بووبوو› ۲. داهاتنەوە؛ چەمیانەوە ‹با یک فشار کوچک تا شد و شکست: بە تۆزە گوشارێک چەمایەوە و شکا›.

تا کردن: ۱. دەق‌کردن؛ تا کردن؛ قەد کردن؛ قەددان؛ دەق‌دان؛ داموچاندن؛ تەواندن؛ نووشتاندنەوە؛ نوێرنایوە؛ قولزاندن ‹پولهایت را تا کن و بگذار توی جیبت: پارەکانت دەق کە و بینە گیرفانت› ۲.

چەماندنەوە؛ ئەوەچەمنەی ‹میله را از وسط تا کن: میلەکە لە ناوەڕاستەوە بچەمێنەوە›
٣. [مجازی، گفتاری] جووڵانەوە؛ هەڵس و کەوت کردن؛ هۆرزونیشتکەردەی ‹بد تا کردن: خراو جووڵانەوە›.

**تا**[2]: *صفت.* دانە؛ دانێ؛ دەنک؛ دەنکە؛ دەندک؛ دانک؛ گلە؛ بە هەژمار یا هەندی دیارەوە ‹دو تا: دوو دانە›.

**تا**[3]: *قید.* تا؛ تەنانەت؛ تەنانە؛ تالای؛ تالاو؛ تاکوو؛ هەتا؛ هەتاکوو؛ هەتاکە؛ هەتاوەکوو؛ هەتتا ‹تا فرش زیر پایش را هم فروخت: تەنانەت قالیەکەی ژێریشی فرۆشت›.

**تا**[4]: *حرف.* هەتا؛ تا؛ تاوەکی؛ هەتاکینێ؛ هەتاکوونێ؛ هەتانێ؛ هەتاوەکوونێ؛ هەتاوەکی؛ هەتاوەکینێ؛ دا: ١. تا وەکوو؛ هەتاوەکوو؛ هەتاکە؛ تاکە؛ وشەی مەرج ‹تا نبینی باور نمی‌کنی: هەتا نەیبینی باوەڕ ناکەی› ٢. هاوکات لەگەڵ ڕووداوێک ‹تا خواست چیزی بگوید پاسبان زد توی دهنش: تا ویستی شتێ بڵێ پاسەوانەکە دایە ناو دەمیا› ٣. تاکوو؛ هەتاکە؛ نیشانەی مەودای کات یا شوێن تا لای ئامانج ‹تا فردا: تا سبەی› ٤. تاکوو؛ بۆ ئەوەی ‹رفت تا بنشیند: ڕۆیشت تا دانیشێت› ٥. تا وەکوو؛ پاش ئەوە ‹بنشین تا بگویم: دانیشە تا بڵێم› ٦. هەرچەند؛ هەرچەندە؛ هەرچن ‹تا می‌توانی بخور: تا دەتوانی بخۆ› ٧. پیتی هەڵسەنگاندن ‹من بیشتر خسته شدم تا او: من زۆرتر ماندوو بووم تا ئەو›.

**تائب** / tā'eb/: [عربی] ☜ **تایب**

**تائوئیسم** / tā'o'îsm/: [؟]/*اسم.* تائۆئیسم؛ دینی تائۆ؛ ئایینێ کە ٦٠٠ ساڵ پێش لە زایین، لە سەر پەند و ئامۆژەکانی لائۆتێسە لە چیندا سەری هەڵدا: **دینِ تائو**

ـ **تائی** / tā'î/ ☜ ـ **تایی**

ـ **تائید** / ta'îd/: [عربی] ☜ ـ **تأیید**

ـ **تائیدیه** / ta'îdîyye/: [عربی]☜ **تأییدیه**

**تاب**[1] / tāb/: *اسم.* ١. تاقەت؛ تاوشت؛ تابشت؛ تاو؛ توان؛ هازی؛ دەست و دوو؛ پۆ؛ هێزۆک؛ هێزک؛ هێز؛ تین؛ نز؛ نزە؛ وزە؛ کێش؛ گرک؛ توێ؛ کار؛ زۆخ؛ توانا؛ قار ‹تاب آوردن: تاقەت هاوردن› ٢. /ـها/ جۆلانە؛ جۆلانێ؛ جۆلانی؛ داردێلەکانێ؛ داردلەکانێ؛ دێلەکانێ؛ دەیدیک؛ دەیدەک؛ دیلان؛ دلارێ؛ دەو؛ دەوگێ؛ دەوگە؛ حوزم؛ هەڕەزان؛ هەڕازگە؛ هڕەزگۆنی؛ هەمچۆلا؛ قا؛ ئێزی؛ ئامرازێک پێکهاتوو لە دوو گوریسی هەڵواسراو و کورسییێک پێوە بەسراو بۆ لە سەر دانیشتن و هاتوچۆ کردن ٣. باو؛ با؛ لۆزان؛ ڕاژان؛ هەژیان؛ ڕوەشیان؛ لەرە؛ کاروانە؛ جۆلانە؛ هەڕاز؛ هەلاجانی نەوەستاو و هەدانەداو بۆ دواوە و پێشەوە ‹تاب خوردن: باو خواردن› ٤. چەفتی؛ خوار و خێچی؛ چەوت و چێڵی ‹چشمش کمی تاب داشت: چاوی نەختێ چەفتی هەبوو› ٥. با؛ وا؛ کار یان ڕەوتی بادان ‹نخ را تاب داد: بەنەکەی با دا› ٦. چرچ و لۆچ ٧. [مجازی] گوڕ و تین؛ تین و تاو.

⊡ **تاب آوردن**: بەرگەگرتن؛ هەڵکردن؛ دەربردن؛ دەوام هێنان؛ کارین؛ تاقەت گرتن؛ تاقەت هێنان؛ خۆگرتن؛ هور کەردەی؛ وەرگەگێرتەی ‹در برابر همەی سختیها تاب آورد و حرفی نزد: لە بەرامبەر هەموو سەختییەکەوە بەرگەی گرت و هیچی نەگوت›.

**تاب برداشتن**: گێریان؛ خوار بوون؛ کەج بوون؛ خەمەو بوون (وەکوو پێچیانی چێوی تەڕ پاش وشکەوە بوون) ‹در، کمی تاب برداشته و خوب کیپ نمی‌شود: دەرگاکە نەختێ گیراوە و باش کپ نابێت›.

تاب بستن: جۆلانە هەڵواسین؛ دێلەکانێ هەڵخستن؛ حوزم هەڵخستن؛ دەوگێ درووس‌کردن؛ ئێزی درووس‌کردن؛ دلـلاریێ هۆروسەی ‹بچەها بە درخت تاب بستە بودند و تاب سواری می‌کرند: منداڵەکان بە دارەکەوە جۆلانەیان هەڵواسیبوو، دێلەکانەیان دەکرد›.

تاب خوردن: باو خواردن؛ با خواردن؛ پل خواردن: ١. جۆلانەکردن؛ دەو خواردن؛ دلـلاریێ‌کەردەی؛ بە سەر جۆلانەوە جوولانەوە ‹اول بگذار من تاب بخورم: هەوەڵ بێلانە با من باو بخوم› ٢. گشت بوردن؛ لەریانەوە؛ هەژیانەوە؛ ڕاژیانەوە؛ سەنگەلا بوون؛ ڕاشەکیان؛ ڕاوەشیان؛ هەلاجان؛ هەڕازان؛ ئەوەلوەی؛ ئەوەشۆکیەی.

تاب دادن: با دان؛ باو دان: ١. قادان؛ بادان؛ پێچ دان؛ لوورکردن؛ هەلپێچاندن؛ تاباندن؛ تامەتش؛ هۆندنەوە؛ تاو دان؛ وادەی ‹داشت سبیلش را تاب می‌داد: خەریک بوو سمێلی با دەدا› ٢. پاڵ پێوە نان؛ دەس پێوە نیان؛ بۆق نان؛ هەلاجاندن؛ شەک لێدان؛ بۆق پوەوەنیەی؛ دەلەکدان لە جۆلانەدا ‹اول تو مرا تاب بدە! بعد من: سەرەتا تۆ پالم بدە نە! ئەوجا من›.

تاب داشتن: ١. بەرگەگرتن؛ هێز هەبوون؛ توانایی هەبوون؛ دەربردن؛ تاقەت هاوردن؛ هاز بیەی ‹تو تاب تحمل آن گرما را داری؟: تۆ بەرگەی ئەو گەرمایە دەکری؟› ٢. لار بوون؛ خوار بوون؛ گێڕ بوون؛ گێڕیاگ بوون.

ـ تاب ٔ: *پیوازە*. ١. ـ ڕێس؛ ـ هۆن؛ ـ موون؛ باد؛ بادەر ‹نخ‌تاب: بەن‌ڕیس› ٢. ـگەشێن؛ ـکەوت؛ ـ تاو ‹شب‌تاب: شەوگەشێن› ٣. ـ تاو؛ ـ هەلکەر؛ ـ داگرسێن؛ گەشکەرەوە؛ گەرم‌کەرەوە، ڕووناکی‌دەر ‹تونتاب: توون‌هەلکەر›.

**تابان** / tābān/: *صفت*. تیشک‌دەر؛ تابان؛ ڕووناکی‌دەر؛ ورشەدەر؛ ترووسکەدەر؛ گرشەدار؛ درەوشان؛ زەریق؛ ڕۆشنایی‌دەر ‹خورشید تابان: هەتاوی تیشک‌دەر›.

**تاباندن** / tābāndan/: *مصدر. متعدی.* //**تاباندی**: لێت‌گرت؛ **می‌تابانی**: لێ‌دەگری؛ **بتابان**: لێگرە// ١. لێ گرتن؛ تێگرتن؛ لێ‌خستن؛ ڕەوشاندن؛ کل‌کردن؛ گێرتەینە؛ وەنەتاونەی ‹چراغ را بە صورتم تاباند: چراکەی گرت لە ڕووم› ٢. تاودان؛ نێل‌دان؛ تین پێدان؛ کل‌کردن؛ گرە پنەدەی ‹تنور را تاباندن: تەنوور نێل‌دان› ٣. مووناندن؛ هۆناندن؛ بادان؛ وادەی ❊**تابانیدن**. هەروەها: **تاباندنی**

■ صفت فاعلی: **تابانندە** (لێگر)/ صفت مفعولی: **تابانده** (لێگیراو)/ مصدر منفی: **نَتاباندن** (لێ‌نەگرتن)

**تابانیدن** / tābānîdan/ ☜ **تاباندن**

**تاب‌بازی** / tāb.bāzî/: *اسم*. جۆلانێ؛ جۆلانی؛ دێلەکانێ؛ داردێلەکانێ؛ دەلدەلەکانێ؛ هەڕزگۆنی؛ هەڕازان وازی؛ دەوگێ؛ کار یان ڕەوتی جۆلانەکردن: **تاب‌سواری**

**تابتا** / tābetā/: *صفت*. تاکولو: ١. چەپ و ڕاست؛ چەپڕاس ‹با چشمهای تابتایش بە من نگاه می‌کرد: بە چاوە چەپڕاسەکانیەوە دەیڕوانی پێما› ٢. /ـها/ تاوەتا؛ لنگاولنگ ‹کفش تابتا: کەوشی تاک‌ولو›.

**تابداده** / tābdāde/: *صفت*. لوول‌دراو؛ بادراو؛ لووردراو؛ وادریا.

**تابدار** / tābdār/: *صفت*. ١. لوول؛ لوور؛ پڕپێچ ‹گیسوی تابدار: ئەگریجەی لوول› ٢. بادراو؛ ڕێسراو؛ لوول‌دراو؛ لووردراو ‹نخ تابدار: بەنی بادراو›.

**تابستان** / tābestān، ـها/: اسم. ١. هاوین؛ تاوسان؛ هامن؛ هامین؛ هاڤین؛ تاوسۆ؛ یەکێ لە چوار وەرزی ساڵ؛ سێمانگەی پاش بەهار ٢. *[مجازی]* گەرمەوەزە؛ گەرما؛ قوڵەی گەرما ‹آن سال از نیمەهای اردیبهشت تابستان شروع شد: ئەو ساڵە لە ناوەڕاس گوڵانەوە گەرما دەستی پێکرد›.

**تابستان‌خوابی** / tābestānxābî/: اسم. هاوینەخەوی؛ تایبەتمەندی بڕێک لە ژینەوەران کە دەبێتە هۆی داهێزران یان خاو بوونەوەیان لە وەرزی هاویندا.

بەرانبەر: **زمستان‌خوابی**

**تابستانی** / tābestānî/: صفت. هاوینی؛ تاوسانی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە هاوین ‹محصول تابستانی: داهاتی هاوینی› ٢. شیاوی هاوین ‹لباس تابستانی: بەرگی هاوینی›.

**تاب‌سواری** / tābsavārî/ ☜ **تاب‌بازی**

**تابش** / tābeš/: اسم. تابشت؛ تاوشت: ١. پرشنگ؛ چرف؛ کار یان ڕەوتی تیشک دانەوە ‹تابش آفتاب: پرسنگی هەتاو› ٢. /ـها/ *[فیزیک]* ناردن و بشاندنەوەی تیشک و تین.

**تابش‌سنج** / tābeššanc، ـها/: اسم. تاوشت‌پێو؛ کەرەسەیەک بۆ شۆندۆزی و پێوانی تابشتگەلی ئیلیکترۆمیغناتیسی.

**تابشگر** / tābešgar، ـها/: اسم. ڕادیاتۆر؛ پەڕەی کانزایی ناو خاڵی جێ هاتوچووی ئاوی داخ بۆ گەرمکردنەوەی ژوور.

**تابع** / tābe'/: [عربی] اسم. پێڕ؛ ڕاژێر: ١. /ـها؛ ـان؛ أتباع/ پەیڕەو؛ پاشکۆ؛ دەست و پێوەند؛ پاشڕەو؛ بەردەست ٢. /أتباع؛ تَبَعە/ خێڵ؛ خەڵک؛ هاو وڵاتی.

**تابعە** / tābe'e/: [عربی] صفت. پێڕەو؛ شۆنگر؛ فەرمانبەر ‹ادارەی تابعە: مەزرینگەی پێڕەو›.

**تابعی** / tābe'î، ـن/: [عربی] اسم. *[قدیمی]* تابعی؛ پەیڕەو؛ کەسێ کە هاونشین و شۆنگری یەکێ لە یارانی پێغەمبەری ئیسلام بووبێ.

**تابعیت** / tābe'îyat/: [عربی] اسم. ڕاژێری: ١. *[نامتداول]* چۆنیەتی ڕاژێری و سەر بە کەس یان شوێنێک بوون ٢. /ـها/ *[سیاست]* چۆنیەتی بەستراو بوون بە وڵاتێکەوە بە پێی بەهرەداری لە ماف و مووچەی هاو وڵاتی بوون لەو وڵاتەدا ‹بە تابعیت آمریکا درآمدن: بە ڕاژێری ئەمریکا دەرهاتن›.

**تابعین** / tābe' în/: [عربی] جمعِ ☜ **تابعی**

**تابکاری** / tābkārî، ـها/: اسم. تینتاوی؛ گەرمکاری؛ تینکاری؛ تاوکاری؛ کار یان ڕەوتی تینداني ماکێک (وەکوو کانزا یان شووشە) بۆ نەرمکردنەوە و کار لەسەر کردنی.

**تابلو** / tāblo، ـها/: [فرانسوی] اسم. تابلۆ: ١. پەڕەیەک (کانزایی، شووشەیی، پلاستیکی و...) کە نووسراوە، وێنە یان هەر دووکیانی لە سەرە و لە جێگەی گشتیدا هەڵیدەواسن تا ئاگاریداریگەلێکی پێ ڕابگەیێنن ٢. پەردەی شێوەکێشی؛ پەڕەیەک کە نیگاری لە سەرکێشراوە ٣. پەڕەیەکی (چێوی، شووشەیی، پلاستیکی و...) پایەدار و شیاو بۆ نووسینی وتە یان کێشانی وێنەیەک لە سەریەوە لە بەرامبەر خەڵکی یان کەسانێکدا (وەکوو تەختە سیا) ٤. پەڕە یان قاپێ کە لە سەر دیوار یان پایەوە دادەمەزرێ و چتگەلێک بۆ بینین یان لە بەر دەستدا بوون لە سەری دادەنرێ ‹تابلوی برق: تابلۆی کارەبا›.

▣ **تابلوی اعلانات/ آگهی**: تابلۆی ئاگاداری؛ تابلۆی ڕاگەیاندن.

**تابلوی برق**: تابلۆی کارەبا؛ سندووقی جێ‌کلیل و فیووزی کارەبا لە سەر دیوار.

تابلوی راهنمایی: تابلۆی ڕێنوێنی؛ تابلۆی داندراو لە سەر ڕێگای هاتوچۆی ماشینان، بۆ ئاگادارکردن و ڕێنوێنی.
تابلوی نقاشی: تابلۆی شێوەکاری؛ ڕووپەڕێک کە تێیدا وێنە یان دیمەنێک کێشراوە.

**تابلو**ٔ: *صفت. [گفتاری، کنایی]* زەق؛ بەرچاو؛ سەرنجڕاکێش لە بەر نائاسایی بوون ‹این کاپشن تابلو است: ئەم کاپشنە زۆر زەقە›.

**تابلوساز** / tāblosāz، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی]/*اسم.* تابلۆساز: ١. کەسێک تابلۆ دروست دەکا ٢. شێوەکار؛ کەسێ کە نیگارکێشی دەکا. هەروەها: **تابلوسازی**

**تابلونویس** / tāblonevîs، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی]/*اسم.* تابلۆنووس؛ کەسێ کە پیشەی نووسینەوە لە سەر تابلۆیە.

**تابلونویسی** / tāblonevîsî/: [فرانسوی/ فارسی]/*اسم.* تابلۆنووسی: ١. کاری نووسینی تابلۆ ٢. کاری تابلۆنووس ٣. /ـها/ شوێن و دووکانی تابلۆنووسی.

**تابناک** / tābnāk/: *صفت.* ڕووناک؛ درەوشان؛ درەوشاوە؛ درەخشان؛ خاوەن تیشک و ڕووناکی ‹چهرەی تابناک: ڕوخساری ڕووناک›.

**تابندگی** / tābandegî/: *اسم.* تیشکدەری؛ درەوشانی؛ ڕووناکی.

**تابنده** / tābande/: *صفت.* تیشکدەر.

**تابو** / tābo، ـها/: [انگلیسی از پولینزیایی]/*اسم.* تابۆ: ١. ڕێز و خاترێک کە ببێتە بەرهەڵست لە وتنی ناوی شتێک، لێنزیک بوونەوەی یان بەکار بردنی ئەو شتە ٢. ئەو شتە کە بەم شێوەیە بە پیرۆز ژمێردراوە ٣. بە خراو دەرکردن یان بەر پێگرتن لە شتێک بەهۆی نەریتی ناو کۆمەڵگا یان هەستی دەروونییەوە ٤. باوەڕ بە پیرۆز بوونی دین و ڕێز لێنانی و هەروەها بەرچاو خستنی بەر پێگیراوگەلی قانوونی.

**تابوت** / tābût، ـها/: [عربی]/*اسم.* تاوت؛ تاویت؛ تابووت؛ لەزاگ؛ وەخم؛ چاردارە؛ سوندروک؛ سوندریک؛ سندووریک؛ تاقێر؛ دارەمەیت؛ دارەبازە؛ داربازە؛ دوودارە؛ داربەست؛ داربەس؛ دارەتەرم؛ تابووتی مردوو گوێزانەوە. هەروەها: **تابوتساز**

**تاب و توان** / tāb-o-tavān/: *صفت. [ادبی]* وزە و هێز؛ توان و تاقەت؛ هێز و توانا؛ تابشت و توان؛ بڕشت؛ بڕس و تاو؛ پۆ؛ تاقا؛ گوژم؛ تاوشت و شێ؛ کێش؛ توانایی تێکۆشان و خۆڕاگری لە بەرامبەر کاری دژوارەوە ‹دیگر تاب و توان ادامەی این کار را ندارم: ئیتر وزە و هێزی درێژە پێدانی ئەم کارەم نیە›.

**تابه** / tābe/ ☜ **ماهیتابه**

- **تابی** / tābî/: *پیوازه.* ١. — ڕێسی؛ — هۆنی؛ - موونی؛ با دان ‹نخ‌تابی: بەن‌ڕێسی› ٢. — تاوی؛ داگرسێنی؛ داییسێنی؛ هەڵاییسێنی؛ هەڵکری؛ پێکری ‹تونتابی: توون داگرسێنی›.

**تابیدن** / tābîdan/: *مصدر. لازم. متعدی.* //**تابیدی**: تیشکتدا؛ **می‌تابی**: تیشک دەدەی؛ **بتاب**: تیشکدە// □*لازم.* ١. تیشکدان؛ تاوین؛ تەیسین؛ تەییسین؛ ئەنەتاویەی؛ پرژانەوەی تیشک و تین ‹آفتاب تابیدن: هەتاو بردیسین› ٢. کەوتن؛ دان؛ لێدان؛ ئەنەتاویەی؛ کەوتەی؛ گەیشتنی ڕووناکی یا تیشک و تین بە شتێک یا شوێنێک ‹آفتاب به اتاق تابید: خۆر لە هۆدە کەوتن› □ *متعدی.* ٣. بادان؛ وادەی؛ مۆناندن؛ هۆندنەوە ‹نخ تابیدن: بەن بادان› ٤. لوولدان؛ پێچدان؛ تەواندن؛ لوورکردن ٥. تاودان؛ گڕدان؛ نێڵ دان؛ گرە پووەوە نیەی: **تافتن** *[ادبی]*.
هەروەها: **تابیدنی**

■ صفت فاعلی: **تابنده** (تیشکدەر)/ صفت مفعولی: **تابیده** (ــ)/ مصدر منفی: **نَتابیدن** (تیشک نەدان)

**تابیده** / tābîde، ها/: صفت. ڕێسراو؛ هۆندراو؛ بادراو؛ پێچدراو ‹نخ تابیده: بەنی ڕیسراو›.

**تابین** / tābîn/: [از عربی؟]/اسم. [قدیمی] تابین؛ بندەست؛ سەربازی ئاسایی.

**تاپ**[1] / tāp، ها/: [انگلیسی]/اسم. تاپ؛ جۆرێک ژێرکراسی بێقۆڵ و کورتی ژنانە کە تا کەمەر دادەپۆشێ.

**تاپ**[2]: [انگلیسی] صفت. [گفتاری] تاک؛ هەڵکەوتە؛ هەڵکەوتوو؛ سەر؛ هێژا ‹جنس تاپ؛ هنرمند تاپ: جنسی سەر؛ هونەرمەندی هەڵکەوتە›.

**تاپ**[3]: صوت. تەپ؛ تەپە؛ تڵپە؛ زرم؛ زرمە؛ دەنگی لە یەک دانی دوو شتی قورس: **تالاپ**

**تاپاله** / tāpāle، ها/: اسم. ١. شیاکە؛ لاس؛ سەرین؛ سەنێر؛ سنێر؛ سەورۆ؛ سەهان؛ ڕەم؛ ڕیخ؛ سەنێری چوارپێیان بەتایبەت ئەسپ و ولاخ و گا ٢. تەپالە؛ تاپالە؛ تەپالێ؛ تەپکە؛ تەپەڵۆک؛ تەپک؛ قلاخ؛ قالاخ؛ قەلاخ؛ دەوە؛ کێویلە؛ لبان؛ سەنێری چوارپێیان کە دەیپێژن و لە بەر تاوەوە وشکی دەکەنەوە و بۆ سووتەمەنی کەڵکی لێ وەردەگرن.

**تاپ ــ تاپ** / tāptāp/: صوت. تەپەتەپ؛ تەپ ــ تەپ؛ تەپەی بەردەوام ‹تاپ ــ تاپ قلبم را میشنیدم: تەپەتەپی دڵم دەبیستەوە›.

⊡ **به تاپ‌ـتاپ افتادن**: کەوتنە تەپەتەپ ‹قلبم به تاپ ــ تاپ افتاده بود: دڵم کەوتبووە تەپەتەپ کردن›.

**تاپ‌تاپ خمیر** / tāptāpexamîr/: [فارسی/ عربی]/اسم. دەس کێ لەبانە؛ دەس کێ لە سەرە؛ جۆرێ گەمەی زارۆکانە کە یەکیان بە دانیشتنەوە تەوێڵی دەنێتە سەر زەوی و باقی بە دەوریدا دەستیان دەنێنە سەر پشتی و دەبێ بزانێ دەستی کێ لە سەر هەموو دەستانە، کە پێی‌زانی، جێ‌گۆڕکێ دەکەن.

**تاپو** / tāpû، ها/: اسم. کووپە؛ کووپەڵە؛ کووپ؛ کووپەرە؛ بستۆگە؛ گوشێ؛ کۆڵینە؛ هۆمە؛ هومە؛ هوومە؛ هۆمرە؛ دەفری گڵینی گەورەی دەم ئاوەلا بۆ جێ ئارد و گەنم و دانەوێڵە.

**تاپ و توپ** / tāp(p)-o-tûp/: صوت. ١. تڵپەتڵپ؛ تەپ و تۆپ؛ تەپەتەپ؛ ڕمبە؛ زرمەزرم؛ دەنگی لێک کەوتنی شتی نەرم و گران یان کەوتنە سەر زەمینی ئەو شتانە: **تالاپ‌ـتولوپ** ٢. تەق و تۆق؛ تەق‌وپۆق؛ تەقەتەق؛ تەقە و ڕەقە؛ دەنگی تیرهاوێژی لە شوێن یەک.

**تاپیر** / tāpîr، ها/: [؟]/اسم. تاپیر؛ جۆرێک گیانداری گیاخۆرە کە لە ناوچەی گەرمەسێری ئەمریکا و مالایا و سووماترا دەژی و بیچمی تێکەڵی ئەسپ و کەرگەدەنە.

**تات** / tāt، ها/: اسم. تات؛ ناوێ کە لە ناوچەگەلی تورک‌نشیندا بە کەسانێ دەڵێن کە بە یەکێک لە زمانە ئێرانیەکان قسە دەکەن (وەکوو خەڵکی هەندێ لادێی دەورو بەری خەلخال و قەزوێن).

**تاتار** / tātār، ها/: اسم. موغول؛ مەغۆل؛ تاتار؛ نەژادی زەرد پێستی ناوەندی ئاسیا.

**تاتاری** / tātārî/: صفت. موغولی؛ مەغۆلی؛ تاتاری؛ پێوەندیدار بە تاتارەوە.

**تآتر** / te'ātr, tā'ātr، ها/: [فرانسوی]/اسم. ١. شانۆ ‹بچەها، تاتر اجرا کردند: مندالەکان، شانۆیان بەڕێوە برد›: **تیاتر** [گفتاری] ٢. ـ‌ها/

تیاترۆ؛ تیاترۆخانە؛ تەماشاخانەی سازندە و سەماکەران ‹دیشب رفتیم تاتر: دوێنێشەو چووینە تیاترۆخانە› * تئاتر

**تاتو / tâtû**، ـها/: [؟]/اسم. تاتۆ؛ جۆرێک ئەسپی کورتەبالا بە یاڵ و کلک و مووی درێژەوە.

**تاتوره / tâtûre**، ـها/: [از لاتینی]/اسم. تاتوولە؛ تاتوولە؛ تاتووره؛ تاتۆڵە؛ تایتووڵە؛ تاتیولە؛ تاتولە؛ گیاگۆیار؛ بنەگیاییکی یەکساڵەی خۆرسکە، تۆمێکی تاڵی ژەهراوی هەیە.

▣ تاتوره هوا کردن/ در هوا پاشیدن: [کنایی] تاس بە سەرا هێنان؛ تاساندن؛ تەواساندن؛ بەرە بەردەی؛ بوونە هۆی گێژی و سەر لێشێواوی خەڵک.

هەروەها: **تاتوره به خورد کسی دادن**

**تاتی / tâtî**/: اسم. دارە‌ـدارە؛ لارە‌ـلارە؛ لەرزە‌ـلەرزە؛ رێگە ڕۆیشتنی منداڵێ کە تازە پای گرتووە: **تاتی‌ـتاتی**

▣ تاتی کردن: دارە‌ـدارە کردن (وەکوو رێچوونی منداڵی تازە پاگرتوو).

تاتی / tâtî/: اسم. تاتی؛ لە زمانە ئێرانییەکان کە زاراوە جۆراوجۆرەکانی لە ئێرانی ناوەندی و ئازەربایجاندا ماوەتەوە: **تاتی‌ـتاتی**

تاتی ـ تاتی / tâtîtâtî/ ☜ **تاتی**

**تاتی‌کنان / tâtîkonân**/: قید. بە دارە‌ـ دارە ‹تاتی‌کنان خودش را بە کنار من رساند: بە دارەدارە خۆی گەیاندە لام›.

**تأثر / ta'assor**، ـات/: [عربی]/اسم. پەژارە؛ خەم؛ خەفەت؛ کوڵ؛ نیگەرانی؛ دڵتەنگی؛ ناڕاحەتی؛ کەسەر ‹تأثر شدیدی بە حاضران دست داد: پەژارەیەکی گران دانیشتوانی داگرت›.

**تأثرانگیز / ta'assorangîz**/: [عربی/ فارسی] صفت. دڵتەزێن؛ خەماوەر؛ خەمدەر؛ پەژاراوی ‹سرگذشتش خیلی تأثرانگیز بود: بەسەرهاتی زۆر دڵتەزێن بوو›: **تأثرآور**

**تأثرآور / ta'assorâvar**/: [عربی/ فارسی] ☜ **تأثرانگیز**

**تأثیر / ta'sîr**، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. کارتێکەری؛ کاریگەریەتی؛ کارلێکەری؛ کار یان ڕەوتی کارتێکردن ‹حرفهایم در او تأثیر داشت: وتەکانم کاری تێکرد›.

**تأثیرپذیر / ta'sîrpazîr**، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕەنگ‌گر؛ ڕەنگ وەخۆگر.

**تأثیرپذیری / ta'sîrpazîrî**، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ڕەنگ‌گری؛ ڕەنگ وەخۆگری.

**تأثیرگذار / ta'sîrgozâr**/: [عربی/ فارسی] صفت. کارتێکەر؛ کاریگەر؛ ڕەنگدەر.

**تأثیرگذاری / ta'sîrgozârî**، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. کارتێکەری؛ کاریگەریەتی؛ کار و ڕەوتی ڕەنگ دانەوە.

**تاج / tâc**، ـها/: [معرب از پهلوی]/اسم. ١. زەرزەنگ؛ تاج؛ تاژ؛ ناقسەرک؛ کومەتیژ؛ کولیلک؛ تانج؛ تانجە؛ کڵاوی ڕازاوەی پادشایان کە بە زێڕ و زەنبەر خەملاوە و لە سەری دەنێن ٢. تەوقەتە؛ تەوقە؛ گەوە؛ بازنەیەکی نەواری لە زێڕ و زیو، گوڵ، پەڕ و پۆ و لەم چەشنانە کە لە هەندێک جێژناندا دەینێنە سەر کەسێکەوە ٣. پۆپە؛ پۆپنە؛ پۆپکە؛ کاکۆڵ؛ کاکول؛ کۆپیتە؛ کاتۆر؛ کاتار؛ پۆپیتە؛ قیتکە؛ قوتکە؛ کوومک؛ کووم؛ کڵاو؛ نیشان؛ قوتکەی سەری بڕێک پەلەوەر (وەک کەلەباب و پەپووسێمانە) ٤. [گیاەشناسی] کڵاوە؛ کوڵاوە؛ کولیلک؛ تانجیک.

▣ تاج خورشید: تاجی هەتاو؛ دەرەوەیی‌ترین پاژی دیاری خۆر کە لە کاتی خۆرگیران دەر دەکەوێ.

تاج دندان: تاجی ددان؛ ئەو بەشە لە

دادان کە لە هاروو دەرهاتووە و مینای دادان داپۆشیوە.

**تاج سد:** تاجی ئاوبەند؛ لووتکەی بەربەند؛ بەرزترین بەشی ئاوبەند.

**تاج سر:** */مجازی/* تاجی‌سەر؛ بەڕێز؛ سەروەر؛ زۆر هێژا و خۆشەویست.

**تاج گل:** تانجیک؛ کڵاوی‌گوڵ؛ تاجی گوڵ؛ تاجەگوڵینە؛ کۆمەڵێ پەڕەگوڵ و لق و پۆی ناسک پێکەوە کە بۆ ڕێزلێنان دەینێنە سەر مەزار یان بەر پەیکەری کەسێک.

▣ **تاج سر کسی بودن:** */مجازی/* تاجی سەری کەسێک بوون؛ لای کەسێک زۆر خۆشەویست بوون؛ سەروەر بوون ‹ایشان تاج سر ما هستند: ئەوان تاجی سەری ئیمەن›.

**تاج‌الملوک** / tācolmulûk, tācolmolûk/: [معرب/ عربی] ☜ **تاج‌مُلوک**

**تاجبخش** / tācbaxš/: [معرب/ فارسی] *صفت.* تاجبەخش؛ خاوەن دەسەڵات و لێهاتوویی لە گەیاندنی کەسێک بە پلەوپایەی پاشایەتی.

**تاج‌خروس** / tāc(e)xurûs, tāc(e)xorûs، ـها/: [معرب/ فارسی] */اسم. [گیاه‌شناسی]/* پۆپەکەڵەشێر؛ پۆپنەکەڕەشێلە؛ پۆپەکەڵەشێرە؛ سەوڵ؛ سواو؛ باقلەک؛ سوارۆک؛ گوڵەمەخموور؛ گوڵ‌عاشقان؛ گوڵ‌بادروو؛ ڕووەکێ کە بە بۆنەی جوانی گوڵە پۆپنەکانیەوە بەخێوی دەکەن ***بستان‌افروز**

**تاجدار** / tācdār، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] *صفت.* تاجدار؛ تاجلەسەر؛ خاوەن تاج.

**تاجر** / tācer، ـها؛ ـان؛ تجّار/: [عربی] */اسم.* بازرگان؛ سەوداگەر؛ مامەلەگەر؛ مامەڵەکار؛ مامەلەچی؛ خاجە؛ تاجر.

**تاجرپیشه** / tācerpîše، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *صفت. /کنایی/* سەوداکار؛ سەوداگەر؛ خاوەن پیشەی مامەڵەکردن.

**تاجریزی** / tācrîzî، ـها/: [معرب/ فارسی] */اسم.* ڕێزلە؛ ڕێزەلە؛ ڕەزلە؛ هلەزرە؛ حلەزرە؛ ترێ‌ڕێوی؛ ڕەسلی ڕووڤی؛ هەلالەوزەمزەم؛ هەلەریزە؛ ڕەزڕەزۆک؛ توولەزەڕە؛ تەماتە مرۆژە؛ شیرین‌وتاڵ؛ قەبقەبۆک؛ گیایێکی چەند ساڵەیە گوڵی سپی یان بەنەوش دەدا و میوەکەی زەردە.

▣ **تاجریزی پیچ:** ڕێزەلەپێچ؛ ڕەزلەمارانە؛ ڕەزلە پێچ؛ پێچ ڕێزلە؛ گیایەکی هاوینی بەردەوامە، گوڵەکانی بەنەوش و گەڵاکەشی لە سەرەوە دەبنە سێ لەت و بەرەکەی بە ڕەنگی سوورە.

**تاجریزی قرمز:** سوورە ڕێزەلە؛ ڕەزەلە سوورە؛ گیایەکی هاوینیە، گوڵەکانی بەنەوش یا سپیە و گەڵاکەشی بە شێوەی دڵە و مێوەیەکی سووری خڕی هەیە.

**تاجریزی سیاه:** ڕەشەڕێزەلە؛ ترێ‌مارانە؛ ترێ‌مارا؛ هەنگوورە مارانە؛ ڕێزلەمارانە؛ گیایەکی یەک ساڵەیە گەڵاکانی دانەدار یان بێ‌دانەیە و بەرێکی ڕەش و خڕی هەیە کە ژەهراویە.

**تاجگذاری** / tācgozārî، ـها/: [معرب/ فارسی] */اسم.* تاجنان؛ کۆڕ و کۆ بوونەوەیەک کە لەوێرا پاشا تاج لە سەر دەنێ و پاشایەتی خۆی ڕادەگەیێنێ.

**تاج‌ملوک** / tācmulûk, tācmolûk، ـها/: [معرب/ فارسی] */اسم.* یەزن‌پەرس؛ دووچکەتاوسە؛ ڕووەکێکی جوانە کە بە بۆنەی جۆراجۆری و شەنگی گوڵەکانیەوە لە ئینجانە و باخچەدا بەخێو دەکرێ: **تاج‌الملوک**

**تاج و تخت** / tāc-o-taxt، ـها/: [معرب/

فارسی]/اسم. تاج و تخت: ۱. [مجازی] نیشانەگەلی پاوشایی یان درۆشمی خونکاری ‹محمد رشید خان، شاه بی تاج و تخت بانه بود: حەمە ڕەشید خان شای بی تاج و تەختی بانە بوو› ۲. پاوشایی؛ پاشایەتی ‹نادر در سال ۱۱۴۸ هـ.ق. به تاج و تخت رسید: نادر لە سالی ۱۱٤۸ ک.م. گەییشتە تاج‌وتەخت› ❋ **تخت و تاج**

**تاجور** / tācvar، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] صفت. [ادبی] تاجدار؛ تاجوەر.

**تاجیک** / tācîk/: اسم. تاجیک: ۱. نەتەوەیەکی ئارياییە لە ڕەگەزی ئێرانی، خەڵکی تاجیکستان ۲. /ـها؛ ـان/ هەر یەک لە خەڵکی ئەو نەتەوەیە.

**تاجیکی**[۱] / tācîkî/: اسم. تاجیکی؛ زمانی خەڵکی تاجیکستان، لە زاراوەگەلی ئێرانی.

**تاجیکی**[۲]: صفت. تاجیکی؛ پێوەندیدار یان سەر بە هۆزی تاجیکەوە ‹پوشش تاجیکی: جل‌وبەرگی تاجیکی›.

**تاخت** / tāxt/: اسم. ۱. غار؛ سنکار؛ چوارناڵە؛ تێر؛ پڕتاو؛ پەلە پاتۆر؛ خار؛ ڕەم؛ ڕەو؛ ڕەڤ؛ لینگ؛ لنگار؛ ترەختان؛ کاری بە پڕتاو ‹اسبش را به تاخت درآورد: ئەسپەکەی غاردا› ۲. هێرش؛ پەلامار؛ پەلەمار؛ شاڵاو؛ هەڵمەت؛ هەو؛ کار یان ڕەوتی دابەڕزان؛ داپڕسکان ‹همه تاخت بردند به طرف خوراکیها: هەموو هێرشیان بردە سەر خواردەمەنیەکان› ۳. [گفتاری] تاق؛ ئاڵشت؛ گۆڕینەوەی شتێ بە شتێکی‌تر.

⊡ تاخت آوردن: هێرش بردن؛ هەڵمەت دان/ هێنان؛ شاڵاو بردن؛ داپڕسکاندن؛ دابەڕزاندن؛ دارسان؛ بە پڕتاو هێرش هێنان. هەروەها: **تاخت بردن**

تاخت زدن: گۆڕینەوە؛ گۆڕانەوە؛ تاق لێدان؛ واڕایەوە ‹ساعتم را با دوربین آزاد تاخت زدم: کاتژمێرەکەم بە دووربینەکەی ئازاد گۆڕیەوە›.

**تاختن** / tāxtan/: مصدر. لازم. متعدی. //**تاختی**: غارت‌دا؛ غاردەدەی؛ **می‌تازی**: غاردەدەی؛ **بتاز**: غاردە// ☐لازم. ۱. غاردان؛ دەرچوون؛ بەرشیەی؛ بەزین؛ بەزان؛ تەراتین؛ تراتین؛ پرتافیان؛ پڕتافین؛ ڕا کردن؛ هەڕا کردن؛ ڕەڤان؛ ڕەتان؛ ڕەتین؛ ڕەتیان؛ تەرقاندن؛ پرتافیەی؛ ڕەمەی؛ ڕەمای ☐متعدی. ۲. ڕەتاندن؛ تاودان؛ ڕەواندن؛ ڕەڤاندن؛ تاژاندن؛ پڕتافانن؛ پرتافنەی؛ لنگ‌دان؛ لنگ کوتان؛ لنگ‌کوتاین ۳. هێرش کردن؛ هێرش بردن؛ هروژم‌کردن ‹همه به آرام تاختند که تقصیر تو بود: هەموو هێرشیان کردە سەر ئارام کە تاوانی تۆ بوو›.

■ صفت فاعلی: **تازنده** (غاردەر)/ صفت مفعولی: **تاخته** (غاردراو)/ مصدر منفی: **نَتاختن** (غارنەدان)

**تاخت و تاز** / tāxt-o-tāz، ـها/: اسم. غار-غارێن؛ ڕەم و ڕمبازی؛ تەڕاتێن؛ شەڕ و شۆ؛ سەرڕەو؛ چار و خار؛ جلێت و دار؛ کار یان ڕەوتی هروژم‌کردن و ڕەواندن.

**تأخر** / ta'axxor/: [عربی]/اسم. دوا؛ دوایی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی جێ گرتن لە دوای دیتر یان دیترانەوە. بەرانبەر: **تقدّم**

**تاخوردگی** / tāxordegî، ـها/: اسم. دەق؛ دەق‌خواردوویی؛ دەق‌بوویی؛ تاخواردوویی؛ دانووشتاوی ‹پارچه را از محل تاخوردگی ببرید: پارچەکە لە شوێنی دەقەکەیەوە ببڕن›.

**تأخیر** / ta'xîr، ـها/: [عربی]/اسم. دێرهات؛ دواکەوت؛ درەنگ؛ دوا ‹قطار دو ساعت تاخیر داشت: شەمەندەفەرەکە دوو سەعات دێرهاتی بوو›.

⊡ تاخیر کردن: دێرکردن؛ درەنگ کردن ‹چرا هر روز صبح تاخیر می‌کنی؟: بۆ چی

هەموو بەیانییێک دیر نەکەی؟›.

**تأدیـب** / ta'dîb/: [عربـی]/اسـم. [ادبـی/ ١. کـار و ڕەوتی ڕاهێنـان؛ پـەروەردەکـردن ٢. کـار و ڕەوتی ئەدەب کـردن؛ ژیرکـردن ‹باید این پسر را تأدیب کرد: دەبێ ئەم کوڕە ژیر بکری›.

**تـــأدیبی** / ta'dîbî/: [عربـــی] صـــفت. پـــەروەردەیـــی ‹حـــبس تـــادیبی: بـــەنـــدی پەروەردەیی›.

**تأدیـه** / ta'diye/: [عربـی]/اسـم. کـار و ڕەوتی دانـەوە؛ دایـەوە ‹آزاد بـدهی خـود را تادیـه کـرد: ئازاد قەرزەکەی خۆی داوە›.

**تـار**[1] / tār، ـهـا/: اسـم. ١. تـاڵ؛ تـا؛ تـار؛ تـان؛ تەل؛ داو؛ هـەودا؛ لـۆ؛ تـەڤـن؛ لۆنـە؛ مـەچـیر؛ دەسک ‹تار مـو: تالـی مـوو›. ٢. [موسیقی] تـەل؛ تـار؛ سـیم؛ ئـەو تـەلانـەی کـە لـە سـازگەلی ژێداردا بـۆ بـە دەنـگ هێنـان بـەکـاری دەبـن ٣. [موسـیقی] تـار؛ لـە سـازگەلی ژێـداری ئێـرانی، شـەش تالـی هـەیـە و بـە زەخمـەوە دەیژەنـن ٤. [نساجی] تـان؛ تـار؛ تانـە؛ ڕاهـێڵ؛ هەودای ئەستوونی بـەن کـە پـۆ بـە لابـەلایـدا دەبوێرن.

▣ **تار صوتی**: ژێ دەنگـی؛ تانـە وردیلـەی نـاو گەروو کە هۆی چۆناوچۆنی دەنگە.

**تـار عنکبـوت**: جۆلاتـەنـە؛ سـروا؛ کـەروو؛ کەرتێنە؛ تـەڤـنە پـیر؛ تـەڤـنۆک؛ تـەڤـنک؛ تـــەڤـــنا پیرێ؛کـــۆنکی پـــیرێ؛ تالـــی کاکـــلەمووشـــان؛ جالـــی جالجالـــووکە؛ هـــەلاوەودۆبالـــی؛ تـەونۆکـەی داپیرۆشـک؛ داوی داوداوی؛ تـــەڤـــنێ تـــەڤـــنپیرکێ؛ هـــەلاوەو مامالـــەهـــەلاوێ؛ دواو ملاکـــەتـــۆ؛ دوورنج.

**تـار کـشنده**: [گیـاهشناسـی] پـرز؛ ڕیـشۆکەی دار؛ هـــەرکـــام لـــە ورتکـــە ڕیـــشەگـــەلی بنیدار.

▣ **تار تنیدن**: هەودا بـەسـتن؛ تـار تـەنـین؛ داو تـەنـین؛ هـەلاوە نیـەی ‹تـار تنیدن عنکبـوت: هەودا بەستنی جالجالۆکە›.

تـار زدن: تـار ژەنـدن؛ تـار لێـدان؛ تـار دایوەنە.

**تـار**[2]: صـفت. تـار: ١. لـێل؛ تـەم؛ تـەمـدار ‹عکسها چـه تـار درآمدەانـد: وێنـەکـان چەنـد لێـل کـەوتوون› ٢. [ادبی] ڕەش؛ تاریـک؛ زەنـگ؛ تەمار ‹شب تار: شەوی تار›.

▣ تار دیدن: لێل دیـتن ‹چشمم همـه جـا را تـار می‌بیند: چاوم هەموو شوێنێک لێل دەبینی›.

تـار شـدن: لـێل بـوون؛ تاریـک بـوون؛ ڕەش هەڵـگەڕان؛ سـیاو بیـەی ‹یکبـاره همـه چیـز پیش چشمم تار شد: لە نەکاو هـەمـوو شـتێک لـە بەر چاوم لێل بوو›.

**تاراج** / tārāc، ـها/: اسم. [ادبی] تـالان؛ تـاژان؛ پـوڕ؛ پوویـر؛ پـویر؛ پـووڕ؛ قـرپ؛ کـالات؛ کالـەت؛ چـەپـاو؛ چـەپـلاو؛ تـالان و مـالان؛ کارەڕەهـاتی دزیـنی مـاڵ و سـامانی خـەڵـکی بە زۆر و ئاشکرایی.

▣ تـاراج شـدن: تـالان بـوون؛ چـەپـاو بـوون؛ کالـەت بـوون؛ تـالان‌کریـان؛ تـاژان‌کـران؛ شـەلیـای؛ بـە زۆر و بـە ڕاشـکاوی دزرانی ماڵ و سامان.

تـاراج کـردن: غـارەت‌کـردن؛ تـالان‌کـردن؛ چـەپـاوکردن؛ تـالان و بـڕۆکردن؛ بـە زۆر و ئاشکرایی دزینی ماڵ و سامان.

بـه تـاراج بـردن: بـە تـالان بـردن؛ چـەپـاو کردن.

به تاراج رفتن: بـە تـالان چـوون؛ ڕۆیـین بـە تالاندا؛ بـە پـووڕ چـوون؛ بـە تـالان و مـالان چوون.

**تـــاراجگر** / tārācgar، ـهـا؛ ـان/: صـفت. تـالان‌کـەر؛ غـارەت‌گـەر؛ چـەپاوکـەر؛ چەپاولگەر.

**تاراق-تروق** / tārāqtorûq/ ☜ تَرَق ـ تُروق

**تارانــدن** / tārāndan/: *مـصدر. متعـدی. [ادبـی]* //**تارانــدی**: تارانــدت؛ **مــی تــاراني**: دەتــارێنی؛ **بِتــاران**: بتارێنــه// تارانــدن؛ ڕەوانــدن؛ ڕەڤـاندن؛ ڕەماندن: ۱. بـڵاوە پــێ‌کــردن؛ دەرکــردن؛ پــرژ و بلاوکردن؛ بەرکــەردەی ‹بـا شلیک تیر هـوایی مردم را تاراندند: بـەتـەقـەی هـەوایـی بـڵاودیـان بـه خــەڵــکەکــه کــرد› ۲. تــەرەکــردن؛ دوور خــستنەوە؛ تۆرانــدن؛ تۆرنــەی؛ تۆرنـای؛ بوونـه هۆی هەڵاتــن و پــرژ و بــڵاوی ‹تـو بـا ایـن زبـان تند و تیزت همـه را از اطـراف خـود تاراندی: تـۆ بـەم زمانە توند و تیژەتـەوە هـەمـووت لـه دەوور و بـەری خۆت تاراند› ✻ **تارانیدن**. هەروەها: **تاراندنی**

■ صـفت فـاعلی: **تاراننــــده** (تارێنــەر)/ صـفت مفعــولی: **تارانــــده** (تــارێنراو)/ مــصدر منفــی: **نَتاراندن** (نەتاراندن)

**تارانیدن** / tārānîdan/ ☜ **تاراندن**

**تاربــام** / tārbām/: *اسـم. [نامتـداول]* بوومـەلـێڵ؛ بوولێڵ؛ کازیوە؛ سـەوگـر؛ سـەهگـور؛ تاریـک و لێڵەی بەیانی؛ تاریک و ڕوونی بەیانی.

**تاربینی** / tārbînî/: *اسم.* لێڵ‌بینی؛ لێڵ‌وینی؛ کـز بوونی سۆمای چاو.

**تــارت** / tārt، ـهــا/: [فرانـسوی]/*اسـم.* تــارت؛ چەشنێک شیرینی کـه لـه هـەویری تایبـەتی شیرینی و میوەی تازە دروست دەکرێ.

**تار تنــک** / tārtanak، ـهــا/: *اسم.* جاڵجاڵــووکە؛ داوتەنە؛ جاوتـەنـه؛ کاکـڵەمووشـان؛ پیرۆشـک؛ داپیرۆشــک؛ دمبــاڵ؛ دۆبــاڵ؛ کارتێنــک؛ جۆڵاتـەنـه؛ تـەڤـنپیچ؛ کـەڤـنی؛ تـەڤـنپیرک؛ داوداوی؛ ماماڵه هەڵاوێ.

**تارریس** / tār.rîs/ ☜ **نَخریس ـ۲**

**تــارزن** / tārzan، ـهــا/: *اسم.* تــارژەن؛ تــارچی؛ ژەنیاری تار.

**تــارک** / tārak، ـهــا/: *اسم.* ۱. کـەفـاک؛ بـانی سـەر؛ تۆقـەسـەر؛ تـەپـڵی سـەر؛ تـەپـڵەسـەر؛ سڵتان سەر؛ تەپـڵ؛ بـەچـگ؛ بـەچـک؛ کـات؛ کاتــک؛ بــۆڵی؛ ڕاستکاســەری؛ تۆقــۆ ســەرەی ۲. لووتکــه؛ ترۆپــک؛ قولــه؛ قوتکــه؛ دونــد؛ کڵاوە؛ سەرکڵاوە؛ پۆپـه؛ چڵەپۆپـه؛ بـەرزتـرین جێگای شوێنێک یان شتێک.

**تــارک‌دنیــا** / tārekedonyā، ـهــا/: [عربــی] *صـفت.* دوورەپــەرێــز؛ لاگــیر؛ تــەرکــەدنیــا؛ تــەریکــەدونیــا؛ چاوپۆشــیو لــه خۆشــیگەلی ژیان.

**تارکــشی** / tārkešî، ـهــا/: *اسـم. [نـساجی]* ☜ **چلّه‌کشی**

**تــــارمی** / tāremî, tāramî، ـهــــا/: *اسـم.* شــەوەکــه؛ تارمــه؛ تارمــێ؛ نــەردە؛ نــەردێ؛ محەجەری بەر هەیوان: **طارمی**

**تار و پــود**/ tār-o-pûd، ـهـا/: *اسم.* ۱. *[نساجی]* تــان و پــۆ؛ ڕایــەڵ و پــۆ؛ دوو ڕشــتەی تێــک تــەنــراوی پارچــه و... ۲. *[مجــازی]* دڵ و دەروون؛ جــەرگ و هــەنــاو؛ نــاخی دڵ ‹تنیده یـاد تـو در تـار و پـودم: بـه بـیری تـۆوە تـان و پـۆم تەنیوە›.

**تــار و تنبــور** / tār-o-tambûr, -tanbûr/: *اسـم. [کنایی]* تار و تەمبـوور؛ تـار و تـەمـوور؛ دایـرە و دمەک؛ چەند سازی مووسیقایی.

**تار و مــار** / tār-o-mār/: *صفت.* تـەفـر و توونـا؛ تەرت و توونـا؛ قـڕ و قـات؛ قـات و قـڕ؛ پـەرژ و بـڵاو؛ تــار و مــار؛ هــەڵاداد؛ نــابووت؛ نــابوود؛ نابوو؛ دەمــار لــێ دەرهــاتوو ‹لـشکر دشمن تـار و مار شد: لەشکری دوژمن تەفر و توونا کەوت›.

**تــاری** / tārî/: *اسـم.* لێـڵـی؛ تــاری ‹آب مرواریـد موجـب تـاری چـشم مـی‌شـود: ئـاومرواری دەبێتـه هۆی لێلی چاو›.

**تــاریخ** / tārîx، ـهــا/: [عربــی]/*اســم.* مێــژوو؛ تــاریخ: ۱. کــات؛ ســات؛ کــات بــه پێــی ڕۆژ، مانــگ و ســاڵ ‹تــاریخ عروسـی را تعیـین کنیـد: کاتــی زەمـاوەنـدەکـه دیـاری بکـەن› ۲. بـەروار؛ ڕێکەوت؛ کـاتی نووسـراوەی نێـو بـەڵـگەیـەک

‹دو قطعه چک به تاریخ اول خرداد دریافت شد: دوودانه چەک بە ڕێکەوتی هەوەڵی پووشپەڕ وەرگیران› ٣. کاتی یەک ڕووداو ‹تاریخ فوت: میژووی کۆچی دوایی› ٤. سەرەتای مێژوو ‹تاریخ هجری: میژووی کوچی› ٥. /تواریخ/ دێرک؛ دیرۆک؛ لقێک لە زانستگەلی مرۆڤانی لەمەڕ تۆمارکردن و لێکدانەوەی ڕووداوگەلی تایبەت بە سەردەمانی ڕابردووەوە ‹علم تاریخ: زانستی میژوو› ٦. /تواریخ/ سەربهوردی بنکە، نەتەوە یان تیرە و تایفەیەک لە چاخێکی دیاریکراودا ‹تاریخ اسلام: میژووی ئیسلام›.

▣ تاریخ انقضا: کاتی بڕانەوە؛ ڕۆژ یان ساڵی بە سەر چوونی مۆڵەت یان مەودایێک.

تاریخ تولید: کاتی بەرهەم هاتن؛ ڕۆژ یان ساڵی دروست بوونی بەرهەمێکی (زیاتر) پیشەسازی.

تاریخ طبیعی: زیندەوەرناسی؛ ژینەوەرناسی؛ ژینەبەرناسی؛ زانستی ناسینەوەی سروشت و زیندەوەران.

**تاریخچه** / tārîxče، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کورتەمێژوو ‹تاریخچەی شهر ما: کورتەمیژووی شارەکەمان›.

**تاریخدان**/ tārîxdān، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* مێژووزان؛ ئەو کەسەی کە لە زانستی مێژوودا شارەزایە. هەروەها: **تاریخشناس**

**تاریخزن** / tārîxzan، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* مێژووکوت؛ مێژوولێدەر؛ کەرەسەیەک کە کات (ڕۆژ، مانگ و ساڵ) لە سەر شتێکەوە چاپ دەکا.

**تاریخگذاری** / tārîxgozārî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کار یان ڕەوتی دیارکردن و ڕوونکردنەوەی تەمەن و دیرۆکی شتێک (وەک بەرد، چێو، قاپۆڕە و ...) کە زۆرتر لە ڕێگەی ئەندازەگرتنی ڕادەی تیشکدەری ئەو شتەوە ئەنجام دەدرێت.

**تاریخ‌گرایی** / tārîxgerāyî/: [عربی/ فارسی] ☜ **تاریخیگری**

**تاریخ‌نگار** / tārîxnegār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* مێژوونووس؛ کەسێ کە پەرتووکی مێژوویی دەنووسێت: **تاریخ‌نویس**

**تاریخ‌نگاری** / tārîxnegārî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* مێژوونووسی؛ کار یان ڕەوتی نووسین یان کۆکردنەوەی مێژوو: **تاریخ‌نویسی**

**تاریخ‌نویس** / tārîxnevîs/: [عربی/ فارسی] ☜ **تاریخ‌نگار**

**تاریخ‌نویسی** / tārîxnevîsî/: [عربی/ فارسی] ☜ **تاریخ‌نگاری**

**تاریخی** / tārîxî/: [عربی] *صفت.* مێژوویی: ١. کەڤنارا؛ زۆر کەونارا ‹اثر تاریخی: ئاسەواری میژوویی› ٢. شیاو بۆ تۆمارکردن و نوسین لە مێژوودا ‹پیروزی تاریخی: سەرکەوتنی میژوویی›.

**تاریخیگری** / tārîxîgarî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* مێژووگەری؛ بیرۆکەیەک کە گرنگی بە مێژوو دەدات: **تاریخ‌گرایی**

**تاریک** / tārîk/: *صفت.* تاریک: ١. تیەریک؛ دیجوور؛ جێگەی پێوار لە ڕووناکی ‹شب تاریک: شەوی تاریک› ٢. لێڵ؛ ئاڵۆز ‹جنبه‌هایی از این بحث برای من تاریک است: چەند لایەنێک لەم باسە بۆ من لێڵە› ٣. *[مجازی]* ناخۆش؛ تاڵ؛ ڕەش؛ سیا ‹گذشتەی تاریک: ڕابردووی ناخوش›.

**تاریک‌اندیش** / tārîkandîš، ـان/: *صفت.* *[مجازی]* تاریکبیر؛ تاریکمژی؛ سیاویر؛ ڕەشبیر؛ بیرڕەش؛ دژی تازەداهێنی، دەسکاری و ڕۆشنبیری. هەروەها: **تاریک‌اندیشی**

**تاریک‌بین** / tārîkbîn، ـان/: *صفت. [کنایی]* ڕەش‌بین؛ تاریک‌بین؛ سیاوین. هەروەها: **تاریک‌بینی**

**تاریکخانە** / tārîkxāne، ـها/: *اسم.* تاریکخانە؛ تاریکەخانە؛ دیوی تاریکی وێنەگرتن.

**تاریک‌وروشن** / tārîk-o-rowšan, -ro:šan/: *صفت.* تاریک و ڕوون؛ بوومەلێڵ؛ بوولێڵە؛ تاریک و ڕۆشن؛ تاریک و لێڵ؛ ڕۆشنایی کەم (وەک بەیانی بەرلە هەڵاتنی خۆر، یان ئێوارە پێش لە داهاتنی شەو).

**تاریکی** / tārîkî/: *اسم.* تاریکایی؛ ڕەشایی؛ تاریکی؛ تاریکە؛ تاریتی: ١. پاش پێوار بوونی خۆر ‹سیاهی شب: تاریکایی شەو› ٢. جێگای تاریک؛ شوێنی تاریک ‹در تاریکی پنهان شد: لە تاریکیدا پەنای گرت›.

**ـ تاز** / tāz/: *پیوازه.* ١. ـبەز؛ ـتاو؛ تاژ؛ تاف؛ تاودەر ‹تیزتاز: خۆش‌بەز› ٢. هەڵمەت؛ پەلامار؛ هێرش ‹تاخت و تاز: هەڵپ و هەڵمەت›.

**تازان** / tāzān/: *قید. [ادبی]* تاژان؛ بەتاو؛ لنگارین؛ ترەختان؛ لە حاڵی تاوداندا.

**تازاندن** / tāzāndan/: *مصدر. متعدی.* //**تازاندی:** تاوتدا؛ **میتازانی:** تاو دەدەی؛ **بتازان:** تاودە// تاودان؛ ڕەتاندن؛ ڕەپاندن؛ بەزاندن؛ هورووژاندن؛ پڕتافتن؛ پڕتافانن؛ پڕتافنەی: **تازانیدن.** هەروەها: **تازاندنی**

■ صفت فاعلی: **تازاننده** (تاودەر)/ صفت مفعولی: **تازانده** (تاودراو)/ مصدر منفی: **نتازاندن** (تاونەدان)

**تازانیدن** / tāzānîdan/ ☜ **تازاندن**

**تازگی**[1] / tāzegî/: *اسم.* تازەیی؛ نوێیەتی؛ تەڕی؛ تەرچکی؛ تەرجگی؛ بار و دۆخ و چۆنیەتی تازە بوون ‹آدم از تازگی میوەها و سبزیها حظ می‌کرد: پیاو لە تازەیی میوە و سەوزیەکان دەگەشایەوە›.

▣ تازگی داشتن: لە لاوە تازە بوون؛ تاسۆخ بوون ‹حرفهایش برایم تازگی داشت: قسەکانی بۆم تازە بوون›.

**تازگی**[2]: *قید.* تازەیی؛ تازەگی؛ بە تازەیی؛ نوهی؛ لە ڕابردووی نزیکدا ‹تازگی شده سرپرست کارگاه: تازەیی بووەتە سەرپەرشتی کارگا›: **تازگیها**

**تازگیها** / tāzegîhā/ ☜ **تازگی**[2]

**تازه**[1] / tāze، ـها/: *اسم.* نوێ؛ تازە؛ نەو؛ نۆ؛ جەخت؛ شتی تازە ‹تازه آمد به بازار: تازە هاتۆتە بازاڕ›.

**تازه**[2]: *صفت.* تازە؛ نوێ: ١. نۆ؛ نەو؛ نفت؛ نووڤ؛ ناڤۆ؛ نەوەیی؛ بەدیهاتوو، سازراو، دۆزراو یان داهێنراو لە ماوەیێکی نێزیکدا ‹سد تازه: بەربەندی نوێ› ٢. نۆ؛ نەو؛ نفت؛ نووڤ؛ ناڤۆ؛ نەوەیی؛ بێ‌هاوتا لە ڕابردوودا ‹حرف تازه: قسەی نوێ› ٣. گوڵبەدەم؛ تەڕ؛ پەژ؛ تەرچک؛ تەرجگ؛ خاوەن سەرسەوزی ‹میوەی تازه: میوەی تازە›.

▣ تازە کردن: تازەکردنەوە؛ نوێ‌کردنەوە؛ تازەوەکەردەی؛ دانانی شتی تازە لە جیاتی هاوتا کۆنەکەی یان پێشووەکەی.

**تازه**[3]: *قید.* تازە: ١. ماوەیەکی کورت بەر لە کاری ناوبراو ‹تازه رفته بودم سر کار: تازە ڕۆیشتبوومە سەر کار› ٢. ئەوساکە؛ ئەوسا؛ ئەوسایچ؛ ئەو سەرەکەی؛ ئەو سەرەکەیچ؛ ئەو سەرەکانی ‹آزاد گفته می‌آید. تازه، اگر هم نیامد خودم می‌روم: ئازاد گوتوویەتی دێم، ئەوسا، ئەگەریش نەهات خۆم دەڕۆم› ٣. ئێستا؛ هێشتا؛ هێما؛ هەڵای ‹شیشه را شکسته، تازه زبان‌درازی هم می‌کند: شووشەکەی شکاندووە، تازە زمانیشی درێژە›.

**تازه به دوران رسیده** / tāzebedowrānresîde، ـها/: [فارسی/ عربی/ فارسی] *صفت. [کنایی]* نۆکیسە؛ تازەکیسە؛ نۆبەخت؛ تازە پێداکەوتوو؛ تازە

پیاکەفتگ؛ خاوەن ئاکاری نالەبار، لە بەر بەدەس هێنانی پارە یان دەسەلاتێک کە هێژای نەبێ.

**تازەداماد**[1] / tāzedāmād، ـها؛ ـان/: *اسم*. زاوا زێڕینە؛ زاوازەڕینە؛ تازە زاوا ‹بە افتخار تازە داماد دست بزنید: بە خۆشی زاوازیرینەوە چەپڵە لێدەن›.

**تازەداماد**[2]: *صفت*. تازە زاوا؛ تازە زاڤا؛ تازە زاما؛ تازە زەما؛ زاوا زێڕینە ‹آزاد تازەداماد است: ئازاد تازەزاوایە›.

**تازەدم** / tāzedam/: *صفت*. تازەدەم؛ تازەدەم‌کێشاو.

**تازەرو** / tāzerû/: *صفت*. *[ادبی]* ڕووگەش؛ خوەشڕوو؛ وەشڕوو؛ ناوچاو ڕۆشن.

**تازەساز** / tāzesāz، ـها/: *صفت*. نۆچێ؛ تازە دروستکراو؛ تازە وەشکریا.

**تازەعروس**[1] / tāze'arûs، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *اسم*. نۆبووک؛ تازەبووک؛ تازەوەوی؛ بووکی تازە؛ بوویکا نۆ؛ بووکە نەخشینە؛ تازەوەیوە ‹تازەعروس دختر فهمیدەای است: تازەبووک کچێکی ژیرە›.

**تازەعروس**[2]: *صفت*. تازەبووک؛ نۆبووک؛ تازەوەوی؛ بووکە نەخشینە؛ تازەوەیوە؛ تازەسور ‹ سارا تازەعروس است: سارا تازەبووکە›.

**تازەکار** / tāzekār، ـها؛ ـان/: *صفت*. ناشی؛ تازەکار؛ نامامیەد؛ باش ڕانەهاتوو لە کاردا.

**تازەمسلمان** / tāzemosalmān، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت*. *[گفتاری]* نۆموسوڵمان؛ تازە موسوڵمان.

**تازەنفس** / tāzenafas، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت*. تازەنەفەس؛ خاوەن هێز و بڕێک کە هێشتا دەکار نەکراوە یان جارێک شەکەتی و کارکردن لێی نەبڕیوە.

**تازەوارد** / tāzevāred، ـها؛ ـان؛ ـین/: [فارسی/ عربی] *صفت*. تازەوارد؛ تازەهاتوو؛ بە تازەیی گەیشتوو جێگا یان کۆمایەک.

**تازی** / tāzî/: *اسم*. تازی: ١. /ـها؛ ـان/ *[ادبی]* عەرەب؛ عەرەو ‹سپاه تازی: سوپای عەرەب› ٢. *[ادبی]* عەرەبی ‹زبان تازی: زمانی تازی› ٣. /ـها/ تاژی؛ تاجی؛ تانجی؛ تانجیە؛ تانزی؛ نەژادێک سەگی قەد باریک و چابک بۆ ڕاو.

▣ **اسب تازی** ☜ **اسب**

**تازیانه** / tāziyāne، ـها/: *اسم*. *[ادبی]* قەمچی؛ قامچی؛ شەلاخ؛ قیرپاچ؛ قورپاچ؛ قورباچ؛ قەرپاچ؛ تازیانە؛ شەللاخ؛ شەللاق؛ قەلا؛ قۆرباج؛ هەودای لە چەرم یان ڕیخۆڵە و... بۆ لێدان و لێخوڕینی چوارپێ.

**تاس**[1] / tās، ـها/: *اسم*. تاس: ١. لەگان ٢. مۆرەی تەختە نەرد ❊ **طاس**

▣ **تاس انداختن**: مۆرە هەڵداشتن؛ مۆرە خستن؛ تاس هەڵخستن؛ مۆرە شانەی ‹تاس انداختم، جفت شش آمد: مۆرەم هەڵداشت، جووت شەش هات›.

**تاس گرفتن**: تاس گرتن؛ مۆرەگرتن (فێڵێکە لە کاتی هەڵخستنی تاسی تەختە نەردا دەیکەن بەشکوو ئەو ژمارە بێنن کە پێویستیانە).

**تاس**[2] /ـها/: *صفت*. تاس؛ هەویز؛ تایبەتمەندی سەری بێ‌موو: **طاس**

**تاس‌بازی** / tāsbāzî، ـها/: *اسم*. تاسبازی؛ مۆرەبازی؛ جۆرە قومارێکە کە بردنەوە و دۆڕاندنی بە مۆرە خستن و چۆن هاتنیەوە بەستراوە.

**تاسعا** / tāse'an/: [عربی] *قید*. *[نامتداول]* ١. نۆیەم؛ نۆهەم ٢. جاری نۆهەم.

**تأسف** / ta'assof، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم*. داخ؛ کەلیلان ‹این اوضاع جای تأسف است: ئەم بار و دۆخە جێگەی داخە›.

▣ **تأسف خوردن**: بەداخ بوون؛ داخ

لێ‌هاتن؛ خەفەت خواردن ‹خیلی بە حالش تأسف خوردم: زۆری بۆ بەداخ بووم›.

**تأسف‌انگیز** / ta'assofangîz/: [عربی/ فارسی] *صفت*. داخدەر؛ داخهێنەر؛ داخێنەر ‹سرگذشت قانع بسیار تأسف‌انگیز است: سەربهوردی قانع گەلێک داخدەرە›.

**تأسف‌آور** / ta'assofāvar/: [عربی/ فارسی] *صفت*. داخدەر؛ داخبار.

**تأسف‌بار** /ta'assofbār/: [عربی/ فارسی] *صفت*. داخدار؛ پڕداخ.

**تاس‌کباب** / tāskabāb/: *اسم*. [فارسی/ عربی] تاس‌کەواو؛ تاس‌کواو؛ جۆرێ چێشتی تەڕە کە لە گۆشت و سێفەزەمینی و پیواز دروست دەکرێ: **طاس‌کباب**

**تاسوعا** / tāsû'ā/: [عربی]/*اسم*. تاسووعا؛ ڕۆژی نۆهەمی مانگی موحەڕەم.

**تاسه** / tāse/: *اسم*. هەناسەبڕکێ؛ هەسکەهەسک؛ هەنکەهەنک؛ هەناسەبڕێ؛ بەرهەنگی؛ دۆخێکە بەهۆی گەرما، تینوویەتی و ماندوو بوونی زۆرەوە بەدی دێ.

**تاسه‌خوار** / tāsexār/: *اسم*. داقەگر؛ بەتاسە؛ تاسەکەر؛ بە ئاوات.

**تاسی** / tāsî، ـها/: *اسم*. تاسی: ۱. نەخۆشیەکی پێستی لە سەردا کە ئەبێتە هۆی وەرین و نەڕووانەوەی موو ۲. بار و دۆخ و چۆنیەتی تاس بوون * **طاسی**

**تأسی** / ta'assî/: [عربی]/*اسم*. پەیڕەوی؛ شوێگری؛ شوێنەڕای؛ چاو لێ بڕی ‹او بە نماز ایستاد و همه بە او تأسی جستند: نوێژی دابەست و گشت بە پەیڕەوی لەو نوێژیان دابەست›.

**تاسیدگی** / tāsîdegî/: *اسم*. ڕەنگ‌پەڕیوی؛ ڕەنگ‌پەڕیاگی؛ هەڵبزڕکاوی؛ هەڵبرزکاوی؛ هەڵبرسکاوی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی ڕەنگ پەڕین ۲. ڕەنگ نەماوی بەهۆی نەخۆشی، ماندوویەتی یان ترسەوە.

**تاسیدن** / tāsîdan/: *مصدر. لازم*. ۱. ڕەنگ پەڕیان؛ ڕەنگ نەمان؛ هەڵبزرکان؛ هەڵبرزکان؛ هەڵبرزکین؛ هەڵبرسکان؛ تاسیان؛ تاسیەی؛ تاسیای ۲. تاسەکردن؛ تارسەکردن؛ ئارەزووکردن؛ کەڵکەڵەکردن ۳. مەگیرانی کردن؛ بێزی کردن؛ بێزگ کردن؛ مزن کەردەی ٤. ئوناق کردن؛ بوغز کردن. هەروەها: **تاسیدنی**

■ صفت فاعلی: **تاسنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **تاسیده** (تاساو)

**تاسیده** / tāsîde/: *صفت*. تاساو؛ ڕەنگ‌پەڕاو؛ ڕەنگ‌پەڕیاگ؛ هەڵبزرکاو؛ هەڵبرزکاو؛ هەڵبرسکاو؛ ڕەنگ‌پڕا.

**تأسیس** / ta'sîs/: [عربی]/*اسم*. کار و ڕەوتی دامەزران؛ دانان؛ هیم دانان؛ بناخە دانان؛ بنەڕەت دانیان؛ بنیات نانەوە؛ مەرزنەیرە؛ ئەرەمەرزنەی؛ پێکهێنانی دامەزراوە یان بنکەیەک ‹تاریخ تأسیس دانشگاه تهران ۱۳۱۳ بود: مێژووی دامەزرانی زانستگای تاران ۱۳۱۳ی هەتاو بوو›.

**تأسیسات** / ta'sîsāt/: [عربی]/*اسم*. دامەزراوە؛ مەزراوە: ۱. کۆمەڵە خانووی تایبەت بە یەک پیشە یان ئامانجێک ‹تأسیسات نظامی: دامەزراوەی چەکداری› ۲. پێداویستیگەلی ئاسایشتی خانوو (وەک دەزگای هەواپاڵێو، گەرمادەر و فێنکیدەر، ئاو، کارەبا، بەتایبەت دام و دەزگای لوولەکێشی و سیمکێشی).

**تأسیساتی**[1] / ta'sîsātî، ـها/: [عربی] / *اسم*. *[گفتاری]* دامەزراوە یان کەسێک کە کاری لەمەڕ ئامرازگەلی پێویست بۆ گەرم و سارد کردنەوەی خانووە.

**تأسیساتی**[2]: *صفت*. دامەزراوەیی؛ سەر بە دامەزراوەوە.

**تاشو** / tāšow, -šo/: ـها/: *صفت*. دەق‌خۆر؛

تاخۆر؛ تایبەتمەندی هەر شتێ کە لە سەر یەک دەق ببێت و کۆ بکرێتەوە ‹میز تاشو: مێزی دەق‌خور›.

**تافتان** / tāftān/ ☜ **تافتون**

**تافتن** / tāftan/ ☜ **تابیدن ـ٥**

**تافتون** / tāftûn، ـها/: *اسم.* تافتوون؛ جۆرێ نانی گەنمە کە لە لەواش ئەستوورتر و بچووکترە، بە تەنووریدا دەدەن: **تافتان**

**تافته** / tāfte/: *اسم.* دێوا؛ حەریر؛ پارچەیەکی ئاورێشمی یان لە هەودای دەستکردی بەن بادراو کە پۆی لە تانی ئەستوورترە.

▣ **تافتەی جدا بافته:** *[مجازی]* چاو ڕەش؛ هەڵگەتگ هۆز؛ چەمێ سیاوێ ‹مگر او تافتەی جدا بافته است کە باید برای خودش اتاق مخصوصی داشته باشد: مەگەر ئەو چاوی ڕەشە کە دەبێ بۆ خۆی ژوورێکی تایبەتی هەبێ›.

**تافی** / tāfî، ـها/: [انگلیسی]*اسم.* تافی؛ شیرنیەکی چکۆلەی زۆرتر چوارپاڵووی چەسپنە کە لە شەکری کولاو، کەرە، قاوە و بادام دروستی دەکەن.

**تاق**[1] / tāq، ـها/: *اسم. [گفتاری]* تاق؛ سرمیچ؛ سەرمیچ؛ سرم: **طاق**

▣ **تاق‌ابرو:** تاقی برۆ؛ کەوانی برۆ.

**تاق نصرت:** تاقی زەفەر؛ تاق‌ئاسای ڕازاوە کە بۆ پێشوازی یا ڕێزنان لە کەسێک یان بیرئانینێک دروست دەکرێ.

▣ **تاق ابرو نمودن** ☜ ابرو آمدن، **ابرو**

**تاق**[2]: *صفت.* ١. *[گفتاری]* تەک؛ تەنیا؛ تاق. بەرانبەر: **جفت** ٢. *[نامتداول]* تاقانە؛ یەکتا؛ تەنیا؛ یەکتەن؛ یەکلە؛ تەنیا باڵ؛ بێ‌هاوتا ***طاق**

**تاقباز**[1] / tāqbāz/: *صفت. [گفتاری]* باز؛ واز؛ کراوە؛ وەکری؛ قالا؛ ئاوەلا (بۆ درگا و دەلاقە) ‹چرا در تاقباز است: ئەوە بۆچی درگاکە بازە›: **طاقباز**

**تاقباز**[2]: *قید. [گفتاری]* ١. پشتەوقەفا؛ قەفا؛ پەشتەقەپەی؛ لە حاڵەتی بە پشتەوە ڕاکشان و خۆ درێژکردنەوەدا ‹تاقباز افتاده بود روی زمین: پشتەوقەفا کەوتبووە سەر زەوین› ٢. ئاوەلا؛ باز؛ واز ‹پنجره را تاقباز کن: پەنجەرەکە باز کە› ***طاقباز**

**تاقچه** / tāqče، ـها/: *اسم.* بالاڕف؛ تاقە؛ ڕف؛ سەرتاق؛ ڕەفە؛ تاقچە؛ ڕەفک؛ شوێنێکە لە ناو قەدی دیواردا ساز دەکرێ بۆ دانانی شتومەک ‹چراغ را روشن کرد و بر تاقچه گذاشت: چراکەی داگیرساند و نایە سەر بالاڕەفەکەوە›: **طاقچه**

▣ **تاقچه بالا گذاشتن:** *[تعریض]* خۆگرتن؛ ناز کردن؛ وێ‌گێرتەی؛ نەواننەی ‹حالا کە بە او احتیاج دارم، برایم تاقچه بالا می‌گذارد: ئێستا کە ئاتاجیم پێیە خۆی دەگری›.

**تاقگان** / tāqgān، ـها/: *اسم.* دالانی سەرداپۆشراو بە تاقلە و کۆلەکەی زۆرەوە: **طاقگان**

**تاقنما** / tāqnemā، ـها/: *اسم.* تاقنوا؛ تاقنوێن: ١. پێکهاتەیەک بۆ جوانی بە شێوازی تاقلە ــ تاقلە بە قەدد دیوارەوە ٢. تاقێکی بەرتەسک کە لە سەر درگا و... دروستی دەکەن ***طاقنما**

**تاق‌وتوق** / tāqq-o-tûq/: *صوت.* تەق‌وپۆق؛ تەقەتەق؛ تەق‌وهۆڕ؛ دەنگی گڕ کە لە وێکخواردنی شتگەلی جۆراوجۆر یا تەقەی لە سەر یەکی تیر لە دوورەوە پێک دێت.

**تاق و جفت** / tāq-o-coft/: *اسم.* تاق و جووت؛ تاق یان جفت؛ تاق‌نەجفت؛ تامانە جووت؛ کاڵەمشتێ؛ گەمەیەکە بەم جۆرە کە کەسێ بڕێک شت دەنێو مستیدا دەشارێتەوە و ئەوی دیکە جووت یان تاق

بوونی بەراورد دەکا.

**تاقە** / tāqe، ـها/:/سم. تۆپ؛ تاقە؛ یەکەی بژاردنی پارچەی پێچراو بە دەوری لوولە یان تەختەدا ‹سە تاقە پارچەی فاستونی: سێ چوب پارچەی فاسۆنی›.

**تاک** / tāk، ـها/:/سم. مێو؛ مۆ؛ مەیو؛ مێوی؛ مەیقی؛ ڕەز؛ بنەترێ؛ داری ترێ؛ داری هەنگوور.

**تاکتیک** / tāktîk، ـها/: [فرانسوی]/سم. تاکتیک: ١. ڕێگە چارەیەکی شیاو و ئەوتۆ بۆ گەیشتن بە مەبەست ‹تاکتیک او این بود کە با جستوخیز خودش، حریف را خستە کند: تاکتیکی ئەوە بوو کە بە هەڵبەز و دابەزی زۆرەوە، حەریفەکەی ماندوو بکا› ٢. زانست و فەنی وەدەست خستنی ئامانجگەلی دیاریکراو ‹تاکتیک نظامی: تاکتیکی چەکداری› ❊ **ڕاهکار**

**تاکس** / tāks/: [فرانسوی]/سم. پیتاک؛ نرخی نەگۆڕی برێک ڕاژەگەلی دەوڵەتی.

**تاکستان** / tākestān، ـها/:/سم. ڕەز؛ ڕەزگە؛ مێوسان؛ باخەمێو؛ مەوستا؛ مەوسان؛ ڕەزجاڕ؛ ڕەزەوار؛ باخی ترێ.

**تاکسی** / tāksî، ـها/: [فرانسوی]/سم. تاکسی؛ ماشێنی سەواری وا کە بە پارە مسافر بۆ شوێنی پێویست دەبا.

▣ **تاکسی تلفنی**: تاکسی تەلەفوونی؛ ئاژانس؛ جۆرێک تاکسی کە بە تەلەفوون بانگ دەکرێت.

**تاکسی بار** / tāksîbār، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] /سم. تاکسیبار؛ وانێتی بارکێش.

**تاکسیدرمی** / tāksîdermî/: [فرانسوی]/سم. تاکسیدیرمی؛ فەن و زانستی وشکەوەکردن و پڕکردنەوەی کەوڵی گیانلەبەران بۆ جوانی: **پوستآکنی**

**تاکسی سرویس** / tāksîservîs، ـها/: [فرانسوی]/سم. تاکسیخەتی: ١. جۆرێک تاکسی کە بە ڕێگایەکی دیاریکراودا هاتوچۆ دەکا ٢. تاکسی تەلەفوونی.

**تاکسیمتر** / tāksîmetr، ـها/: [فرانسوی]/سم. تاکسیمیتر؛ ئامێرێکە لە نێو تاکسی دایدەنێن و بە پێی درێژایی ڕێگە و ماوەی ڕابواردوو، کرێی مسافر حەساو دەکا.

**تاکن** / tākon، ـها/:/سم. دەقدەر؛ دەقکەر؛ تاکەر: ١. ئامێری تایبەتی دەقکردنی شتێک (وەک پارچە، ڕۆژنامە و کانزا) ٢. کەسێ کە بەرپرسیاری ئاوەها کارێکە.

**تأکید** / ta'kîd، ـها؛ ـات/: [عربی]/سم. پێداگری: ١. جەخت؛ کوت ‹پدرم بر این موضوع تأکید داشت: بابم لە سەر ئەم بابەتە جەختی دەکرد› ٢. کار یان ڕەوتی دەرخستن یان پێش چاو خستنی شتێک ‹روی برخی هجاها تأکید می‌کرد: لە سەر برێک برگەگەل پێداگری دەکرد›.

**تاگالگ** / tāgālog/:/سم. تاگالۆگ: ١. نەتەوەی دورگەی لوزوون لە فیلیپین ٢. /ـها/ هەرکام لە کەسانی ئەو نەتەوە ٣. زمانی ئەو نەتەوە، لە زمانگەلی مالیزی- پلینیزیایی.

**تالاب** / tālāb، ـها/:/سم. تالاو؛ چەلاو؛ ئاوپەنگ؛ پەنگاو؛ گەبەڵ؛ دەشتێک کە ئاوی مەندی تێدایە.

**تالاپ** / tālāp/ ☜ **تاپ**[٣]

**تالاپ ـ تولوپ**/ tālāptûlûp/ ☜ **تاپ‌وتوپ ـ١**

**تالار** / tālār، ـها/:/سم. تەلار؛ بالاخانە؛ تالار؛ هۆدەیەکی هەراو کە درێژایی لە هەشت گەز کەمتر نیە: **طالار**

**تالاسمی** / tālāsemî/: [فرانسوی]/سم. [پزشکی] تالاسیمی؛ نەخۆشیەکی میراتی مرۆڤە دەبێتە هۆی کەمخوێنی و بێهێزی.

**تالاموس** / tālāmûs/: [فرانسوی]/سم. ١.

*[گیاەشناسی]* تالامووس؛ بەشێکە لە ئەندامی گوڵ و گیا ٢. *[کالبدشناسی]* بەشێک لە تەختایی مێشک.

**تالان** / tālān، ـها /: [ترکی] اسم. *[نامتداول]* چەپلاو؛ چەپاو؛ تالان؛ پوورِ؛ تالان و بڕان؛ تالان و مالان؛ تالان و تاژان.

**تالش** / tāleš/: اسم. تالش؛ هۆزێکی ئێرانین کە لە باشووری خۆرئاوای دەریای خەزەرەوە دەژین.

**تالش‌انگور** / tālešangûr/ ☜ انگورفرنگی، **انگور**

**تالشی** / tālešî/: اسم. تالشی: ١. لە زمانگەلی ئێرانی باو لە نێو تالشدا ٢. ـها/ خەڵکی تالش.

**تألم** / ta'allom، ـات/: [عربی] اسم. *[ادبی]* کەسەر؛ خەم؛ پەژارە؛ خەفەت؛ کوڵ؛ جخار؛ جەخار ‹این وقایع موجب تألم خاطر گردید: ئەم ڕووداوانە کەسەری لە سەر دڵ دانا›.

**تالی** [1] / tālî/: [عربی] اسم. *[فلسفه]* شوێنهات؛ دوو؛ بەدوو ‹اگر بگویند آتش علت گرم شدن آب است، آتش مقدم و گرم شدن آب تالی است: ئەگەر بێژن ئاگر هۆی گەرم بوونی ئاوە، ئاور پێشینە و گەرم بوونی ئاو شوێنهاتە›.

**تالی** [2]: صفت. *[ادبی]* دوایی؛ دواگین؛ دمایین؛ دمایی.

**تألیف** / ta'lîf/: [عربی] اسم. دانان؛ نووسین؛ نویسەی؛ گردپەڕ: ١. ـها؛ ـات/ پەرتووک، پەخشان یان بە گشتی نووسراوەیەک کە کەسێ بە یارمەتی بیر و هزر، نوێکاری، ئەزموون یان لێکۆڵینەوەی خۆی نووسیویەتی ‹تاریخ شرفنامه تألیف میرشرفخان بدلیسی است: مێژووی شەرەفنامە نووسینی میرشەرەفخانی بدلیسیە› ٢. کار یان ڕەوتی نووسینی ئاوەها ئاسەوارێک ‹او کتابی دربارەی گیاهان دارویی زاگرس تألیف کرد: کتێبێکی سەبارەت بە گیای داروویی زاگرۆسەوە نووسی›.

**تالیم** / tāl(i)yom/: [فرانسوی/ انگلیسی] اسم. تالیۆم؛ توخمێکی کانزایی نەرم و ژەهریە بە ژمارەی ئەتومی ٨١ و کێشی ئەتومی ٢٠٤,٣٧ کە بۆ دروستکردنی ژەهر و بڕێ کەرستەی کارەبایی و شیشەسازی بە کار دێ.

**تام** / tām(m)/: [عربی] صفت. تەواو؛ خشت؛ بێ‌کەم و زیاد ‹اختیار تام: دەسڕۆیی تەواو›.

**تامارزو** / tāmārzû، ـها /: [؟] صفت. *[گفتاری]* بە ئاوات؛ تامازرۆ؛ تامەزرۆ؛ ئارەزوومەن؛ تاسوخ؛ ئارەزوومەندی وەدەست هێنانی شتێ کە کەمتر بۆی چەلاوە.

**تام‌الاختیار** / tāmmol'extiyār/: [عربی] صفت. بکوژ و ببڕ؛ خۆڕا؛ دەس‌واز؛ تەواو سەربەست؛ ئازاد لە ئەنجامدانی کارێک لە لایەن کەس یان کەسانێکەوە ‹نمایندەی تام‌الاختیار دولت: نوێنەری بکوژ و ببڕی دەوڵەت›.

**تامپون** / tāmpon، ـها/: [فرانسوی] اسم. *[پزشکی]* تەنزیف؛ تیکەی لۆکە یان هەور کە بۆ گیرساندنەوەی خوێن یان هەڵمژینی خوێن و ئاوی زەخم بە کار دەبرێ.

**تام‌تام** / tāmtām/: [انگلیسی از هندی] اسم. *[موسیقی]* تام- تام؛ جۆرە سازێک لە بیچمی دەف کە بەرگەکەی لە کانزایە و بە میلەیەک دەیژنن: **گُنگ**

**تأمل** / ta'ammol، ـها؛ ـات/: [عربی] اسم. *[ادبی]* ١. *[نامتداول]* کار و ڕەوتی تێ‌ڕامان؛ تێفکرین؛ ورد بوونەوە؛ چاو بۆ بەرەوە خستن و دوانۆڕی‌کردن ‹در این باره باید خوب تأمل کنی: لەم بارەوە دەبێ باش تێ‌ڕامینی› ٢. وێستان؛ درەنگ؛ وێسان؛ مەدرەی ‹پس از مدتی تأمل گفت... : دوای

کەمێ وەدستان گوتی...›.

**تام‌وتمام** / tāmm-o-tamām/: [عربی] قید. تێر و پڕ؛ تێر و تەسەل؛ بەتەواوی؛ بە گشتی؛ بە شێوەی گشتی و بێ‌کەم و زیاد.

**تامیل** / tāmîl/: اسم. تامیل: ١. هۆزی دراویدی خەڵکی هێند و سریلانکا ٢. ـها/ هەر کام لەو خەڵکانە ٣. زمانی ئەو هۆزە.

**تأمین** / ta'mîn، ـها؛ ـات/: [عربی] اسم. ١. دابین؛ کار یان ڕەوتی دابین‌کردن؛ مسۆگەرکردن؛ ساز دان؛ ئابوور یان پێک هێنان ‹تأمین مخارج عروسی: دابین‌کردنی خەرج و بەرجی زەماوەند› ٢. پەنا دان؛ هەڤاندن؛ دالدەدان؛ کار یان ڕەوتی هەدا دان ‹تأمین دادن: پەنا دان› ٣. دڵنیایی؛ ئاسایش؛ ئاسوودەیی؛ هێمنی؛ هێمنایەتی؛ هەدار؛ پشتگەرمی ‹اینجا تأمین جانی ندارم: لێرەدالە گیانی خۆم دڵنیایم نیە›.

▣ تأمین آتیه: دابینی داهاتوو؛ کار و ڕەوتی پێک‌هێنانی پێویستیگەلی ژیان بۆ داهاتوو.

تأمین اجتماعی: دابینی کۆمەڵایەتی؛ ئاسوودەیی کۆمەڵایەتی؛ ئاسایشتی کۆمەڵایەتی؛ زنجیرە چالاکی پێویست بۆ دابینی داهاتووی کۆمەڵ.

تأمین جانی: دڵنیایی گیانی؛ هەداری گیان؛ ئارخەیانی گیانی.

▣ تأمین دادن: دڵنیا کردن؛ هەدناندن.

تأمین داشتن: دڵنیا بوون؛ پشتگەرم بوون.

تأمین شدن: پێک هاتن؛ دابین بوون؛ ساز بوون.

تأمین کردن: پێک هێنان؛ دابین‌کردن؛ ئابوورکرن؛ سازکردن؛ مسۆگەرکردن.

**ـ تان** / etān/: ضمیر. ـتان: ١. ـــ تا؛ جێناوی لکاو بۆ دووهەم کەسی کۆ ‹کتابتان: کتێبەکەتان› ٢. جێناوی بەرکاری لکاو بۆ دووهەم کەسی کۆ ‹آوردندتان؛ بردندتان: هێناتانیان؛ بردتانیان› ٣. [گفتاری] ـتا؛ بۆ ئێوە ‹بستان نیست؟: بەستان نیە؟› ٤. [گفتاری] ـــ تا؛ بە ئێوە ‹بهتان گفته بودم: پێتانم گوتبوو›.

**تانتالیم** / tāntāl(i)yom/: [فرانسوی] اسم. تانتالیۆم؛ توخمێکی کیمایی بە ژمارەی ئەتومی ٧٣ و کێشی ئەتومی ١٨٠,٩٤، کە کانزاییێکی سەخت و خۆڕاگر لە بەرامبەر ئەسیدەکانەوەیە و لە پیشەسازیدا بۆ دروست‌کردنی ئامرازگەلی برینکاری بە کاری دێ.

**تانک** / tānk، ـها/: [انگلیسی از گجراتی] اسم. ١. مەترالیزە؛ دەبابە؛ تانک؛ ڕەواندژ؛ ماشینی زرێ و زنجیرداری تایبەت بۆ شەڕ کە تۆپ و شێست‌تیری لە سەر داندراوە ٢. بۆشکە؛ بەرمیل؛ تانک؛ تانکی؛ دەفری گەورەی سەرداپۆشراو، جێ‌ئاو و نەوت و...

**تانکر** / tānker، ـها/: [انگلیسی] اسم. ١. بۆشکە؛ بەرمیل؛ دەفری گەورەی سەر داپۆشراو، جێ‌ئاو و نەوت و.. ٢. تانکیر؛ کەشتی یان ماشێنی گەورەی گواستنەوەی تراو.

**تانگو** / tāngo/: [فرانسوی] اسم. تانگۆ؛ جۆرە هەڵپەڕینێکی نەرم و نیانی دوو کەسی ڕۆژاواییە.

**تانن** / tānan، ـها/: [فرانسوی] اسم. جەوهەرمازوو؛ تراوێکی لە شینکە گیراوە کە بۆ دەباغی و ڕەنگرێژی و... بە کار دێ.

**تأنی** / ta'annî/: [عربی] اسم. [ادبی] خاوەخاو؛ لە سەر خۆیی؛ هێدیکایی؛ هێواشی ‹این همه تأنی برای چیست؟: ئەم هەمووە خاوەخاوە بۆ چیە؟›.

**تأنیث** / ta'nîs/: [عربی] اسم. [ادبی] مێینەیی؛

مێوینەیی؛ مێڵەیی؛ مەینە ‹در زبان فارسی بر خلاف عربی علامت تانیث وجود ندارد: لە زمانی فارسیدا بە پێچەوانەی عەرەبی نیشانەی مینەیی نیە›.

**تاوان** / tāvān. ـھا/:اسم. تاوان؛ تەشبی: ١. بژارە؛ خیسڵ؛ ئەوەی لە قەرەبووی زیاندا بدرێت یان وەربگیردرێت ‹باید تاوان شیشەای را کە شکستی بدهی: دەبێ تاوانی ئەو شووشەی شکاندت بدەی› ٢. باربوو؛ زەرەر و زیان یان گەزندێ کە کەسێک بە هۆی هەڵەکاری، کەمتەرخەمی یان ئازار گەیاندن بە دیترانەوە دەیبینێ ‹خان زمینگیر شده بود و داشت تاوان روزهای گذشتەاش را پس می‌داد: خان زەویگیر ببوو، خەریک بوو تاوانی ڕۆژانی ڕابردووی دەدایەوە›.

**تاوان‌نامە** / tāvān.nāme، ـھا/:اسم. تاوان‌نامە؛ نووسراوەیێک کە چۆناوچۆنی دانەوەی تاوانێکی تێیدا دابین کراوە: **غرامت‌نامە**

**تاول** / tāval، ـھا/:اسم. بلۆق؛ پۆرگ؛ تۆقلە؛ گۆزاوڵە؛ شۆقل؛ تلۆق؛ تاولە؛ بلۆقە؛ پفیلک؛ ئاوەزوولک؛ زیپکەی هەڵتۆقیوی پڕئاو.

**تاول‌زا** / tāvalzā/: صفت. بلۆقێنەر؛ پۆرگزا؛ بلۆقزن؛ تایبەتمەندی ئەوەی لە سەر پێست بلۆق دروست بکا.

**تاون** / tāvan، ـھا/:اسم. فڕ؛ کوورەی چێشت چێ کرن.

**تاووس** / tāvûs/: [معرب از آرامی]/اسم. تاووس؛ تاوس؛ مەلێکی وڵاتی هیندە کە بەتایبەت نێرەکەی لە جوانیدا بەناوبانگە * **طاوُس؛ طاووس**

**تاووسی** / tāvûsî، ـھا/: [معرب]/اسم. گوڵەگزگانە؛ تەپۆلەگیراو؛ گوڵەگزیانە؛ ڕوەکێکە لاسکی سەوزی باریکەڵەی هەیە و گوڵی زەرد و بۆنخۆشی لێ دەڕسکێ.

**تاوە** / tāve/ ☜ **ماهیتابە**

**تاویل** / ta'vîl، ـھا؛ ـات/: [عربی]/اسم. ڕەوتی واتا لێکدانەوە؛ وەزرین؛ ڕاژە و لێکدانەوەی مەبەستی بێژەر، جگە لەوەی کە لە ڕواڵەتی وتەکەی دەردەکەوێ.

**تأهل** / ta'ahhol/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* هاوسەرداری؛ بار و دۆخی هاوسەردار بوون (ژن یان مێرد).

▣ **تأهل اختیار کردن**: هاوسەر هەڵبژاردن؛ لف‌گرتن.

**تای** / tāy/:اسم. تای: ١. هۆزی زەرد پێستی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، دانیشتووی وڵاتی تایلەند و دەورو بەری ٢. /ـھا/ هەرکام لە خەڵکی ئەو هۆزە ٣. زمانی تای، لە زمانگەلی هیندوچینی-سیامی.

**تایب** / tāyeb/: [عربی] صفت. *[ادبی]* تۆبەکار ‹مژدگانی کە گربە تایب شد: مزگێنی بەن! گوربە بوو بە تۆبەکار›.

**تایپ** / tāyp/: [انگلیسی]/اسم. تایپ: ١. مەکینەی نووسین ‹بنشین پشت تایپ و این نامە را بزن: دانیشە پشت تایپەکە و ئەم نامەیەم بۆ لێدە› ٢. نووسین بە مەکینە ‹مقالە را تا فردا تایپ می‌کنم: وتارەکە تا بەیانی تایپ دەکەم›.

**تایپی** / tāypî، ـھا/: [انگلیسی] صفت. تایپی؛ تایپ‌کراو؛ بە ماشین نووسراو ‹مقالە چهار صفحەی تایپی بود: وتارەکە چوار لاپەڕەی تایپ‌کراو بوو›.

**تایپیست** / tāypîst، ـھا/: [انگلیسی]/اسم. پیت‌چن ‹بە یک نفر تایپیست نیازمندیم: پیت‌چنێکمان پێویستە›.

**تایر** / tāyer/: [عربی]/اسم. تەگەرە؛ هارە؛ پێچک؛ تەگەری؛ تایرە؛ چەرخ: **طایر**

**تایمر** / tāymer، ـھا/: [انگلیسی]/اسم. کات‌بژێر؛ ئامرازێک بۆ ڕاگرتن و ڕێخستنی

کات لە برێ کەرەسەدا ‹این رادیو تأیید هم دارد: ئەم ڕادیوە تەئییدیشی هەیە›.

تایی / tāyî/: پیوازه. ــ دانەیی؛ بە ئەندام یان توخمەوە ‹دوتایی: دووتایی›: ــ تائی

تأیید / ta'yîd، ـات/: [عربی]/اسم. ١. پەسەند؛ پەسەن؛ کار یان ڕەوتی پەسەند کردن؛ چەسپاندن؛ ئەرێ لێدان؛ وەرگرتن؛ دروست یان شیاو زانینی وتەیەک، کارێ یان کەسێک ‹حرف شما را تأیید می‌کنم: قسەکەی ئێوە پەسەند دەکەم› ٢. پشتیوانی؛ کار یان ڕەوتی یارمەتی دان یان پشتیوانی لێکردن ‹مردم دولت را تأیید کردند: خەڵکی پشتیوانی دەولەتیان کرد› ✽ تأئید

تأییدیه / ta'yîdîyye، ـها/: [عربی]/اسم. بڕوانامە؛ پەسەندنامە؛ نووسراوەیێک کە دروستی بەڵگەیێک یان ڕاستی وتەیێک ڕادەگەیەنێ و دەسەلمێنێ.

تئاتر / te'ātr/: [فرانسوی] ☜ **تآتر**

تئاتری / te'ātrî/: [فرانسوی] ☜ **تآتری**

تئودولیت / te'odolît، ـها/: [فرانسوی]/اسم. تیئۆدولیت؛ دووربینی نەخشە هەڵگری.

تئوری / te'orî، ـها/: [فرانسوی]/اسم. تیۆری؛ بیرۆکە؛ لێدوانێک بەدانستە بۆ ڕوون کردنەوەی نهێنیەکی زانستی یان مەبەستێکی بیرەوانی.

تئوریسین / te'orîs(i)yan، ـها/: [فرانسوی]/اسم. بیرۆکەوان؛ دانەری بیرۆکە ‹گاندی تئوریسین عدم خشونت بود: گاندی [illegible] دووری لە شەڕاشۆیی بوو›.

تئوریک / te'orîk/: [فرانسوی] صفت. بیرۆکەیی؛ بیرۆکەیی ‹مبانی تئوریک: بنەماگەلی بیرۆکەیی›.

تئوزوفی / te'ozofî/: [؟]/اسم. تیئۆزۆفی؛ ئامۆژەوانی سەبارەت بە خودا و جیهان بە پێی ڕوانگەی سۆفیانەوە.

تئوکراسی / te'ok(e)rāsî/: [؟]/اسم. خوداسالاری؛ خواسالاری؛ تیئۆکراسی.

تئین / te'în/: [؟]/اسم. تێئین؛ کافێینی وەرگیراو لە گەڵاچای.

تب / tab/: اسم. تاو؛ تەو: ١. ـها/ تەب؛ تا؛ تێ؛ یاو؛ نۆبەتی؛ گڕ؛ گڕۆن؛ بەرز بوونەوەی پلەی گەرمای لەش لە شۆی ئاسایی ‹بچه تب دارد: منداڵەکە یاوی هەیە› ٢. *[مجازی]* گڕ؛ شۆڕ ‹تب فوتبال: تاوی فووتباڵ›.

▣ تب اردو: ڕەش گرانی؛ ئێشاگران؛ گرانەتێ؛ نەخۆشی گرانەتا.

تب برفکی: تەوەقە؛ تەوەق؛ تەبەق؛ جۆرێک نەخۆشی کارگی کە زیاتر لە دەم و پای ئاژەڵدا سەر هەڵدەدا.

تب پنج‌روزه ☜ **تب خندق**

تب تند: تاوی تیژ؛ تاوی زۆر؛ یاوی بە قەوەت.

تب ربع: سێبەرۆ؛ سێ‌ڕۆ؛ تای سێبەڕۆ؛ نۆبەتی سێ ڕۆژە.

تب روده‌ای: کەوتەیی؛ کەفتەیی؛ نەخۆشینێ گەندەڵینی گیرۆ کە زۆرتر لە ڕێگای خواردنی چێشت، شیر و ئاوی پیسەوە تووش دەبێ و ئەبێتە هۆی یاو، زگەشۆرێ، بێ‌حاڵی، سەرئێشە و ماسینی ڕیخۆڵە.

تب زرد: یەرەقان؛ زەردەیی؛ نەخۆشینێکە زۆرتر لە وڵاتانی گەرمەسێرەدا سەر هەڵدەدا.

تب طوطی: نەخۆشینی تووتی؛ نەخۆشینێکە مرۆڤ و تووتی تووشی دەبن کە یاو و لەرز و زگچوون لە نیشانەکانیەتی: **بیماری طوطی**

تب لازم: سل؛ ئازارەسی؛ دەردەباریکە؛ ئازارە باریکە.

تب نوبه: نۆگە؛ ڕۆژناڕۆژە؛ مالاریا.

◘ تب چیزی بالا رفتن:*[مجازی]* تافی هاتنی شتێک؛ کاتی هەرەمە و جەنگەی شتێک هاتن.
تب داشتن: تەودار بوون؛ یاودار بوون؛ یاو بیەی.
تب کردن: تەوکردن؛ یاوکردن.
تب بریدن: یاو بڕیان؛ یاو نەمەنەی؛ لاچوونی یاو ‹شربت خورد، تبش برید: شەربەتی خوارد، یاوی بڕیا›.
تب کسی را بریدن: یاوی کەسێک بڕین؛ تێکۆشان بۆ هێنانە خوارەوەی یاوی نەخۆش بە نووشتە و دۆعا و...

**تبادل** / tabādol، ـها؛ ـات/: [عربی]*اسم.* گۆڕاوگۆڕکاری؛ ئاڵشت؛ ئاڵوگۆڕی؛ گوهەڕ؛ کار یان ڕەوتی گۆڕینەوە؛ ئەوەوارەی؛ گۆڕاننەوە؛ وارەتەیەوە؛ پێ‌گهۆڕین.
◘ **تبادل افکار**: هاوفکری؛ هاوبیری؛ بیر و بۆچوونی خۆ لە بارەی شتێکەوە لەگەڵ کەس یان کەسانی‌تردا نانە بەین.
هەروەها: **تبادل‌نظر**

**تبار** / tabār/:*اسم.* بنەماڵە؛ ڕەگەز؛ ڕەتەوە؛ نەژاد؛ تۆرەمە؛ وەچە؛ بنچینە؛ نیژاد؛ ڕیشەی بنەماڵەیی، نەتەوەیی یا ڕەگەزی.

**تبارک** / tabārak/: [عربی] *صفت. [ادبی]* پیرۆز؛ هەزەخ؛ بەبەرەکەت؛ مبارەک؛ ممبارەک.

**تبارک‌الله** / tabārakallāh/: [عربی] *دعا.* خوا بیکاتە خێر؛ خودا پیرۆزی کات؛ خودا مبارەکی کات.

**تباسیدن** / tabāsîdan/: *مصدر. لازم. [نامتداول]* داهێزران؛ داهێزان؛ داهێزیان؛ تەواسان؛ تەوەسیای؛ لەش گران بوون لە تا یان لە گەرمادا.

**تباشیر** / tabāšîr/:*اسم.* تەباشیر؛ دەرمانی یاو بڕین: **طباشیر**

**تبانی** / tabānî، ـها/: [از عربی]*اسم.* کاکە و برالە؛ ساز و باز؛ ساخت و پاخت؛ سەر و پاخت؛ سەین و بەین؛ کەین و بەین؛ خلێنە و بلێنە؛ خۆمانە‌ـخۆمانە؛ پێک‌هاتنی بە نهێنی لە سەر کارێک (زیاتر ناڕەوا) دژ بە کەس یان کەسانی‌تر.

**تباه** / tabāh/: *صفت. [ادبی]* زایە؛ خەرا؛ خراو؛ خەراب؛ خەسار؛ تەبا؛ بەفیڕۆ چوو؛ لە کار کەوتە ‹او این بچە را تباه می‌کند: ئەو ئەم منداڵە زایە دەکات›.

**تباهکار** / tabāhkār/ ☜ **تبهکار**

**تباهی** / tabāhî، ـها/:*اسم. [ادبی]* خراپی؛ خەرابی؛ گەندەڵی؛ خراوی؛ لە نێو چوویی؛ لە بەین چوویی؛ بە فیڕۆ چوویی.

**تباهی‌آور** / tabāhîāvar, -'āvar/: *صفت. [ادبی]* گەندەڵی‌هێنەر؛ بەدی‌هێنەری خراپی.

**تباین** / tabāyon، ـات/: [عربی]*اسم. [ادبی]* جیاوازی؛ ناتەبایی؛ وێک نەچوویی ‹این دو انتخاب با هم تباین دارند: ئەم دوو هەڵبژاردنە لێک جیاوازیان هەیە›.

**تب‌بر** / tab.bor، ـها/: *صفت.* یاوبڕ؛ بە توانایی یان تایبەتمەندی هێنانە خوارەوەی گڕی لەش و لە ناو بردنی یاو ‹آسپیرین از داروهای تب‌بر است: ئاسپیرین دەرمانێکی یاوبرە›.

**تبتی** / tabbatî/:*اسم.* تەبەتی: ١. /ـها/ هەر یەکە لە خەڵکی ناوچەی تەبەت یا منداڵەکانیان کە لە ڕەگەزی مەغولی و تێکەڵاو لە گەڵ چینی و هیندین ٢. زمانی خەڵکی تەبەت، لە زمانگەلی چین و تەبەتی.

**تبحر** / tabahhor/: [عربی]*اسم.* شارەزایی؛ لێزانی؛ زانایی؛ زۆرزانی؛ کارامەیی؛ چاکزانی؛ چازانی؛ باش‌زانی؛ پسپۆری ‹او

در تاریخ باستان بحر زیادی دارد: ئەو لە مێژووی کەونارادا بەرچێکی زۆری هەیە›.

**تبخال** / tabxāl، ـهـا/: اسم. خشرۆک؛ تمیسک؛ تێمیسک؛ یاومز؛ یاونیشان؛ وەدایش؛ ئێمشک؛ کەرمشک؛ زرپک؛ قرتماغەی دەور لێو کە بە هۆی نەخۆشی (بەتایبەت یاو) یان ڕاچڵەکینەوە سەر هەڵدەدا.

**تبختر** / tabaxtor/: [عربی]/اسم. لووتبەرزی؛ دەمارزلی؛ بەدەماری؛ خۆزلبینی؛ گەوزەیی؛ خۆ بە زل زانی؛ بادی هەوایی ‹در رفتارش بحر نبود: لە ئاکاریدا چوچەبەرزی نەبوو›.

**تبخیر** / tabxîr، ـهـا/: [عربی]/اسم. ١. ڕەوتی بوونە هەڵم؛ گۆڕانی دۆخی شتی تراو بەرەو دۆخی هەڵم و گاز ٢. کار یان ڕەوتی بوونە هەڵم.

**تبخیرسنج** / tabxîrsanc، ـهـا/: [عربی/فارسی]/اسم. ئامێرێک بۆ ئەندازە گرتنی خێرایی بوونە هەڵمی ئاو.

**تبدار** / tabdār/: صفت. نۆبەتیدار؛ یاودار؛ کەسێ کە تای لێدێ.

**تبدل** / tabaddol، ـهـا؛ ـات/: [عربی]/اسم. [ادبی] گۆڕانکاری؛ ئاڵوگۆری؛ ڕەوتی گۆڕان؛ گۆڕدران؛ واڕەی.

◙ تبدل عناصر: [شیمی] گۆڕانکاری کیمیاوی؛ کار و ڕەوتی گۆڕانی توخمێکی کیمیایی و بوونە توخمێکیتر.

**تبدیل** / tabdîl، ـهـا؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. جێگۆڕکێ؛ یاگەواڕێ؛ ڕەوتی جێنیشتنی شتێک لە جێی شتێکیتر ٢. ڕەوتی داگەڕان؛ گۆڕدران؛ گۆڕانی چۆناوچۆنی یا دۆخی شتێک ‹تبدیل آب بە بخار: گۆڕانی ئاو بە هەڵم› ٣. گۆڕینەوە؛ گۆڕاندنەوە؛ گهۆڕین؛ ئەوە واڕەی؛ واڕایەوە ‹تبدیل پول بە جنس: گۆڕینەوەی پارە بە شت› ٤. تیکەیێک بۆشی چکۆلە بە دوو دەمی گەورە و بچووکەوە بۆ گۆڕان یان لکاندنی لوولەیێکی ئەستوور بە یەکێکی ناسکترەوە.

◙ تبدیل بە احسن: چاکترکردن؛ دانانی شتێکی چاکتر لە جێی شتیتر.

◙ تبدیل شدن: بوون؛ گۆڕدران؛ بیەی ‹خانەاش بە یک قمارخانە تمام عیار تبدیل شدە بود: ماڵەکەی بووە قومارخانەیەکی شەش دانگ›. هەروەها: **تبدیل کردن**

**تبذیر** / tabzîr، ـهـا؛ ـات/: [عربی]/اسم. [ادبی] هەڵەخەرجی؛ وێڵخەرجی؛ ئەبلەخەرجی؛ بلەخەرجی.

**تبر** / tabar، ـهـا/: اسم. باڵتە؛ بیور؛ بێور؛ بیڤر؛ بڤر؛ تەور؛ تەوەر؛ تەڤر؛ تەوڤر؛ تەبر؛ تەوەر؛ بێپۆژ؛ سیکارد؛ نالجح؛ ئامرازی داربڕین.

**تبرا** / tabarrā/: [عربی] ☜ **تبرّی**

**تبرئە** / tabra'e/: [عربی]/اسم. فحیل؛ پاکانە؛ کار یان ڕەوتی تۆمەت سڕینەوە؛ ئازاد بوون لە تاوان و دەرکەوتنی بێگوناهی کەسێک ‹پس از دو سال زندانی شدن، سرانجام تبرئە شد: دوای دوو ساڵ بەندی بوون، ئاخری فحیل بوو›.

**تبرزد** / tabarzad/: اسم. ١. [ادبی] قەندی سپی ٢. نەبات ٣. تەبەرزە؛ مێوەی زۆر چاک و ئاودار.

**تبرزین** / tabarzîn، ـهـا/: اسم. تەبەرزین؛ تەوەرزین؛ تەورنجاخ؛ تەورادین؛ تەڤەر؛ چەکێک بوو وەک تەور بە دەستی سوارەوە (وەک ئەوەی دەروێشان دەیخەنە سەرشان).

**تبرع** / tabarro'، ـات/: [عربی]/اسم. [ادبی] باربوو؛ کاری بەخت کردن؛ بەخشین و چاکەکاری بۆ ڕەزامەندی خوا.

**تبرعـــاً** / tabarro'an/: [عربـــی] قیـــد. [ادبـــی] بەباربوویی؛ بۆ پێ خۆش بوونی خوا: **تبرّعی**
**تبرعی** / tabarro'î/: [عربی] ☜ **تَبرُّعاً**
**تبـــرک**[1] / tabarrok/: [عربـــی] اســـم. [نامتـــداول] پیرۆزی؛ تەبەڕوکی؛ مبارەکی؛ تەوڕک.
**تبـــرک**[2]: صـــفت. [گفتـــاری] پـــیرۆز؛ هـــەزەخ؛ تـــەوەڕک؛ متـــەبـــەڕک ‹از مکـــه آوردەام تبـــرک است: لە مەکەوە هێناومە پیروزە›.
**تبـــری** / tabarrā/: [عربـــی] اســـم. خۆپـــارێزی؛ کـــار یـــان ڕەوتی خـــۆ دوور خـــستنەوە؛ دووری کـــردن؛ خـــۆلادان؛ خۆپاراســـتن؛ لا گێرتـــەی: **تبرّا**
**تبـــری** / tabarî/: اســـم. تـــەبـــەری: ١. زمـــانی دانیـــشتوانی کـــۆنی مـــازەنـــدەران، یـــەکێـــک لـــە زمانـــە ئێرانیـــەکـــان ٢. /ـــها؛ ـــان/ خـــەڵـــکی تەبەرستان * **طَبری**
**تبریـــد** / tabrîd/: [عربـــی] اســـم. کـــار و ڕەوتی ســـارد کردنـــەوە؛ ســـەردەو کـــردن؛ چیـــاوە کەردەی.
**تبریـــزی**[1] / tabrîzî، ـــها/: اســـم. تـــەورێـــزی؛ چنـــار؛ دارقـــەڵـــەم؛ شـــەلی؛ خـــوور؛ خۆجـــەلی؛ هـــۆلێر؛ دارشـــۆخ؛ ئـــەســـپین؛ دارێکـــی بـــەرزی خـــەزەڵـــوەرە لـــە تـــیرەی داربیـــان، کـــەڵـــکی زۆری لـــە پیـــشەســـازیدا لـــێ وەردەگـــرن: **شالَک؛ ارّەقلعه**
**تبریـــزی**[2] /ـــها/: صفت. تـــەورێـــزی؛ تـــەبرێـــزی؛ سەر بە شاری تەورێز لە ئازەربایجاندا.
**تبریـــک** / tabrîk، ـــها؛ ـــات/: [عربـــی] اســـم. پیرۆزبـــایی؛ موبـــارەکبـــادی؛ مبـــارەکبـــادی؛ مبارەکبایی؛ چاوڕوونی.
**تبزا** / tabzā/: صفت. یاوهێنـــەر؛ تـــاوزا؛ یـــاوزا؛ خاوەن تایبەتمەندی گڕ خستنە لەشەوە.
**تبـــسم** / tabassom، ـــها/: [عربـــی] اســـم. زەردە؛ بزە؛ بـــسکە؛ زەردەخـــۆ؛ وردە بـــزە؛ زەردەخـــەنـــە؛ گـــەشـــکە؛ زەردەکـــەنی؛ ســـرچ؛ زەردەخـــوە؛ بزەی لێو و گەشەی ڕوو لە خۆشیان.
▣ تبسم کـــردن: مـــزچین؛ مزمـــزین؛ بـــزەکـــردن؛ گورمزین؛ بزە هاتنە ســـەر لێـــو؛ زەردەخـــەنـــە کردن؛ بسکەکردن.
**تبـــشیر** / tabšîr/: [عربـــی] اســـم. [ادبـــی] ١. مـــزگێنیدەری؛ مـــزانیدەری؛ کـــار یـــان ڕەوتی مزگێنی دان ٢. ڕاگەیانـــدنی ئـــایینی فـــەلـــە لـــە نێو کەسانیتردا.
**تبـــصره** / tabsere, tabsare، ـــها/: [عربـــی] اسم. ڕوونکـــاری؛ کورتـــە ڕاژەیـــەک کـــە لـــە ســـەر مـــاددەیـــەکـــی قـــانوون، بنـــەمانامـــە یـــا دۆزنامـــەیێـــک، بـــۆ ڕوونکردنـــەوەی زیـــاد دەکرێ.
**تبـــع** / taba'، ـــات/: [عربـــی] اسم. [نامتـــداول] ١. شوێنهات؛ پەیهاتە ٢. شوێنکەوت.
◙ به تبع آن: بـــەشـــوێن ئـــەودا؛ بـــەپـــێ ئـــەودا؛ بەدووی ئـــەودا؛ بـــە دوای ئـــەوا؛ شـــۆ نیـــشەرە ‹بقیـــەی مقالـــه هـــم به تبع آن بایـــد اصـــلاح شـــود: باقی وتـــارەکـــەش بـــە شـــوێن ئـــەودا دەبـــێ ڕێـــک بکرێتەوە›.
**تبعـــات** / taba'āt/: [عربـــی] اسم. پـــەیهاتـــە ‹اگـــر غیبـــت کنـــی، بایـــد تبعـــات آن را هـــم بپـــذیری: ئـــەگـــەر نەییتەوە، دەبێ پەیهاتەکانیشی قەبووڵ کەی›.
**تبعـــــه** / taba'e/: [عربـــی] اسم. ١. [نامتـــداول] جمعِ ☜ **تـــابع** ٢. /اتبـــاع/ ســـەر بـــە؛ خـــەڵـــک؛ شاروەند ‹تبعەی ایرانی: شاروەندی ئێرانی›.
**تبعیـــــت** / taba'îyyat، ـــها/: [عربـــی] اســـم. پـــــەیـــــڕەوی؛ پێـــــڕەوی؛ شـــــۆنەڕایـــــی؛ شـــوێنکـــەوتـــوویی ‹در هـــر کـــاری از او تبعیـــت می‌کرد: لە هەر کارێکیدا لەو بەدەووی دەکرد›.
**تبعیـــد** / tab'îd/: [عربـــی] اسم. ڕەوتی تارانـــدن؛ دوور خستنەوە؛ شـــەلـــپین؛ ڕەوانـــدن؛ جۆرێـــک سزایە بۆ کەسانێ کـــە دەوڵـــەت مانـــەوەیـــان لـــە نیشتنگەیانـــدا بـــە بـــڤە دەزانـــێ و بریـــەتیـــە لـــە ناردنیان بۆ شـــار یـــان وڵاتێکـــی تـــر ‹دو سال به

خاش ... شد: دوو ساڵ ... بۆ خاش›.

**تبعیدگاه** / tab'îdgāh، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. تاراوگە؛ جێگەیەک کە دوورخراوە ناچارە تێیدا بمێنێتەوە.

**تبعیدی** / tab'îdî، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت*. دوورخراوە؛ تاراوی؛ سەرگوون ‹او قبلاً تبعیدی بوده است: ئەو جاران دوورخراوە بووە›.

**تبعیض** / tab'îz، ـها؛ ـات/: [عربی] /اسم. دووچاوەکی؛ کار و ڕەوتی جوولانەوە یان داوەری نابەرانبەر لەمەڕ بڕێ کەسانەوە، بەرامبەر بە کەسانی‌تر.

▣ تبعیض جنسی: دووچاوەکی جنسی؛ دۆخ یان چۆنیەتی یەک نەزانینی ژن و مێرد لە بەرانبەر مافی کۆمەلایەتی و مرۆڤانیەوە.

تبعیض نژادی: دووچاوەکی نەژادی؛ دووچاوەکی ڕەگەزی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەرانبەر نەزانینی نەژادگەل لەگەڵ یەکتریدا، یان بەرزتر زانینی نەژادێک لە نەژادانی دیکە.

**تبلور** / tabalvor/: [عربی] /اسم. ١. داناری؛ بار و دۆخ یا چۆنیەتی بوونە بلۆر ٢. شەختین؛ مەیسین؛ گیرسان و وەک بلۆر لێهاتن ٣. ڕسکاوی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی وێنە بەستن و دەرکەوتن؛ ڕسکان ‹احساسات او در شعرهایش تبلور یافته است: هەستی لە شیعرەکانیدا ڕسکاوە›.

**تبلیغ** / tablîq، ـات/: [عربی] /اسم. بانگەشە؛ ڕاگەیێنی: ١. کار یان ڕەوتی ئاگادارکردن یان دڵ‌پێخۆش‌کردنی کەسانێک لە باشی و کەڵکی شت یان شتگەلێک ‹خیلی برای این کالا تبلیغ شد: گەلێک بۆ ئەم کالایە بانگەشە کرا› ٢. بانگەواز؛ کار یان ڕەوتی دنە دانی کەسان بۆ ئەنجام دانی کارێک یان نەکردنی ئەو کارە ‹تبلیغ بر ضد مواد مخدر: ڕاگەیێنی دژی مەوادی خاوکەر›.

**تبلیغات** / tablîqāt/: [عربی] /اسم. بانگەشە؛ بانگەواز؛ کۆمەڵێک لەو کارانەی کە بۆ خۆش‌کردنی لایەنگری یان لانەگری و دژایەتی لەگەڵ شتێکدا ئەنجام دەدرێن.

**تبلیغاتچی** / tablîqātčî، ـها/: [عربی/ ترکی] اسم. *[گفتاری]* ڕاگەیێنەر؛ بانگەشەکار؛ کەس یان دامەزراوەیێک کە کاری ڕاگەیاندنە.

**تبلیغاتی** / tablîqātî/: [عربی] *صفت*. بانگەشەیی؛ سەر بە ڕاگەیاندن ‹ فعالیتهای تبلیغاتی: چالاکی بانگەشەیی›.

**تبلیغی** / tablîqî/: [عربی] *صفت*. ڕاگەیاندنی.

**تبه** / tabah/: *صفت. [مخفف]* خەسار؛ زایە؛ لەکیس‌چووگ.

**تبهکار** / tabahkār، ـها؛ ـان/: *صفت*. خراپکار؛ خەرابکار؛ خراپەکار؛ خاوەن خۆ یان گرۆی ئاکاری چەوت و نالەبار ‹ گروه تبهکار: کۆمەڵی خراپکار›: **تباهکار**

**تبهکارانه** / tabahkārāne، ـها/: *صفت*. خراپکارانە.

**تبهکاری** / tabahkārî، ـها/: *اسم*. خرابکاری؛ خراپکاری.

**تبهگن** / tabahgen/: *صفت. [ادبی]* دابەزیو؛ داکەوتوو؛ بەرەو خوار هاتوو بۆ پلەیەک، چینێک یان جۆرێکی خوارتر لە دۆخی ئاسایی خۆی.

**تبهگنی** / tabahgenî/: *اسم. [ادبی]* دابەزیوی؛ داهاتوویی؛ ڕەوتی نەوی بوونەوە بۆ پلە و دۆخێکی نزمتر.

**تبیین** / tabyîn/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ١. ڕوون کردنەوە ٢. دەربڕین.

**تپ ـ تپ** / teptep/: *صوت*. تەپەتەپ؛ دەنگی کپی هەستاوە لە وێک‌کەوتنی دوو شت.

**تبیینی** / tabyînî/: [عربی] *صفت*. دەربڕاو؛

ڕوون کراوە.

**تپانچه** / tapānče، ـها /:اسم. ١. دەمانچە؛ دەوانچە؛ دەبانچە؛ دەرمانجە؛ دەرمانچە؛ چەکی گەرم و چکۆلە کە لە گیرفاندا جێی دەبێتەوە ٢. [قدیمی] شەقەزیلە؛ شەپاڵە؛ شەپلاخە؛ چەپلاخە؛ شەقەزلە؛ شەقەزللە؛ زیللە؛ سیلە * **طپانچه**

**تپاندن** / tapāndan/ ☜ **چپاندن**

**تپش** / tapeš، ـها/:اسم. کوتە؛ تەپە؛ چڵ؛ چڵک؛ پل؛ لەرە یان لەرزەی لە سەر یەک.

▣ **تپش قلب**: دڵەتەپێ؛ دڵەتەپە؛ دڵەرپە؛ دڵەکوتە؛ دڵەکوتێ؛ دڵەگورپێ؛ گورپە؛ تەپەدڵ؛ خورپە؛ توند لێدانی دڵ بە شێوەیەک کە هەستی پێبکرێ: **طپش**

**تپق** / topoq/: [ترکی]/اسم. گت؛ گیرانی کوتوپڕی زمان کە دەبێتە هۆی خراپ وتنی وشە یان هەڵەکردنی ڕستە.

**تپل** / topol، ـها/: صفت. [گفتاری] گردەڵ؛ گردەڵە؛ قرپنە؛ خرپن؛ خرتەڵ؛ خەپە؛ گردڵ؛ خەپەلە؛ خەپەلێ؛ خرتەڵە؛ خرتەڵێ؛ کورتە باڵای خرکەڵە: **تُپُلی**

**تپلی** / topolî/ ☜ **تپل**

**تپنده** / tapande/: صفت. بە خروپە؛ خاوەن هەست و جووڵە.

**تپور** / tapûr/:اسم. تەپوور: ١. هۆزی نیشتەجێی باکووری ئێران کە دوای کۆچی ئارياييەکان، بەرەو تەبەرستان (مازندەرانانی ئێستا) هەڵنران ٢. /ـها؛ ـان/ تەپووری؛ هەرکام لە کەسانی ئەو هۆزە.

**تپه** / tappe، ـها/:اسم. تەپۆڵکە؛ گردوڵکە؛ گر؛ حەدەف؛ حەندەف؛ گوژمە؛ چغا؛ کوننەلان؛ متک؛ گرد؛ گرۆ؛ گرت؛ گەڕ؛ تەپک گردۆڵە؛ باسک؛ تەپە؛ تەپۆکە؛ تەپۆلکە؛ تەپۆڵە؛ تەپەکڵە؛ گرک؛ بەرزاييەک کە لە ٣٠٠_٤٠٠ میتر تێپەڕ ناکا.

**تپه ماهور** / tappemāhûr، ـها/:اسم. خێز؛ زوورک؛ زوورکان؛ کاجینە؛ گەوە؛ گەد؛ زەوی پڕ لە کەند و لەند.

**تپیدن** / tapîdan/: مصدر. لازم. //**تپیدی**: خورپیت؛ **می تپی**: دەخورپی؛ **بتپ**: بخورپە// ١. خورپین؛ خورپان؛ تەپین؛ لێدان؛ دای وەنە ٢. ترنجیان؛ پەستان؛ بە زۆر چوونە ناو جێگايێکی تەنگەوە * **طپیدن**. هەروەها: **تپیدنی**

■ صفت فاعلی: **تپنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **تپیده** (خورپیو)/ مصدر منفی: **نَتپیدن** (نەخورپین)

**تتا** / tetā/: [یونانی]/اسم. تێتا؛ ناوی هەشتەمین پیتی ئەلفوبێتکەی یونانی (Θ,θ).

**تتابع** / tatābo'/: [عربی]/اسم. [نامتداول] کار و ڕەوتی ڕێچکەبەستن: ١. دوابەدوا؛ شۆن بە شۆن ٢. شوێنیەکگری؛ کار یان ڕەوتی پەیڕەوی کردن لە یەکتری.

▣ **تتابع اضافات**: [دستور] بەدوای یەکتردا ڕێچکە بەستنی چەند وشە.

**تتبع** / tatabbo'، ـات/: [عربی]/اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی توێژینەوە؛ لێکۆڵینەوە؛ لێکدانەوە؛ بە دوادا چوون؛ شۆنیەرە لوەی ‹چهل سال از عمرش را به تتبع سپری کرد: چل ساڵ لە ژیانی بە توێژینەوە خەریک بوو›.

**تترون** / tetron/: [؟]/اسم. ١. تێترۆن؛ هەودا؛ ڕیشاڵی پۆلیستر ٢. قوماشی دروستکراو لە تیترۆن.

**تتق** / totoq/:اسم. [نامتداول] دەوار؛ چادر؛ چادرە؛ چادور؛ تاوڵ؛ ڕەشماڵ؛ سیاماڵ؛ زۆم.

▣ تتق زدن نور: خەرمانەدان؛ تیشک دانەوە وەکوو ئاڵقەیەک بە دەوری

شتێکدا.

تتماج / totmāc/: [ترکی]/اسم. تۆتماج؛ چەشنێک چێشتی تەڕ کە لەگەڵ هەویری ناندا دروستی دەکەن.

تتمه / tatamme, tatemme، ـها/: [عربی] /اسم. پاشماوە؛ دوماو؛ تەواوکەر؛ دمامەنە ‹تتمه‌اش را فردا می‌آورم: پاشماوەکەی بەیانی دێنم›.

▣ تتمه‌ی حساب: پاشماوەی حسێب؛ باقی حیساب ‹تتمه‌ی حساب شما چقدر است؟: پاشماوەی حسێبەکەی ئێوە چەندە؟›.

تتمیم / tatmîm/: [عربی]/اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی تەواو کردن؛ دوایی هێنان؛ تەمامنەی.

تته‌پته / tetepete/: اسم. [گفتاری] ١. پتەپتە؛ ترە ترە؛ لالەلال؛ پتەپت؛ چۆنیەتی زمان گیران، بەتایبەت بۆ تاوێک کە بە هۆی دەسەپاچە بوون یان هەست بە شەرمەزاری کردنەوە ڕوو دەدا ‹وقتی پرسیدم: چرا دیر کردی؟ به تته‌پته افتاد: کە پرسیم: بۆچی دێرت کرد؟ کەوتە پتەپتەوە› ٢. پرتەوبۆڵە؛ ورتەورت؛ پرتەپرت؛ بۆڵەبۆڵ؛ وتەی لە بەر خۆوە ‹قدری تته‌پته کرد که من نفهمیدم: هێندێک پرتەوبۆڵەی کرد کە تێنەگەیشتم›.

تثبیت / tasbît/: [عربی]/اسم. سەقامگیری؛ جێگری؛ کار یان ڕەوتی پتەو بوون؛ چەسپان؛ جێگیر بوون؛ ڕاگیر بوون؛ دامەزران؛ بەتایبەت لە یەک دۆخ، کار یان پلەیەکدا ‹تثبیت حکومت به زودی انجام شد: سەقامگیری حکوومەت هەر زوو سەری گرت›.

تثلیث / taslîs/: [عربی]/اسم. ١. کار و ڕەوتی سێبەش کردنەوە ٢. سێبەشی؛ سێیەتی؛ سیانەیی ٣. [مسیحیت] سێپیرۆزان؛ باب و کوڕ و گیانی پیرۆز (خودا و مەسیح و جبرائیل) ئامۆژەی خاچپەرستی لە بارەی پەرستنی خودا و جبرەییل و مەسیحەوە.

تثنیه / tasniye/: [عربی]/اسم. ١. دوانەیی؛ دوویەتی ‹علامت تثنیه: نیشانەی دوانەیی›.

تجار / toccār/: [عربی] جمعِ ☜ تاجِر

تجارب / tacāreb, tacārob/: [عربی] جمعِ ☜ تجربه

تجارت / tecārat، ـها/: [عربی]/اسم. بازرگانی؛ توجارەت؛ سەودا؛ دان و سان؛ دان و ستان.

▣ تجارت آزاد ☜ بازرگانی آزاد، **بازرگانی**

تجارتخانه / tecāratxāne، ـها/: [عربی/فارسی]/اسم. سەوداخانە؛ مامەڵەخانە؛ بنکەی بازرگانی؛ نووسینگە یان مەوازەیەک کە کاری دان و سانی تێدا دەکرێ.

تجارتی / tecāratî/: [عربی] صفت. توجارەتی؛ سەر بە بازرگانی و سەندن و فرۆشتنەوە.

تجاری / tecārî/: [عربی] صفت. بازرگانی؛ توجاری؛ سەر بە سەودا و مامەڵە ‹فعالیتهای تجاری: چالاکی توجاری›.

تجانس / tacānos/: [عربی]/اسم. [ادبی] وەکهەڤی؛ گونجانی؛ پێکەوەیی؛ هاوڕەنگی؛ هاوشکڵی.

تجاوز / tacāvoz، ـها، ـات/: [عربی]/اسم. دەسدرێژی؛ دەسرێژی؛ کار و کردەوەیێک بۆ گەزن گەیاندن یان لە نێو بردنی مافی کەسانی تر ‹تجاوز نظامی: دەسدرێژی چەکداری› ٢. دۆخ یان چۆنیەتی تێپەڕین؛ لادان؛ لادان لە ڕادەی دیاریکراو ‹عده‌ی حاضران از هزار نفر هم تجاوز کرد: ژمارەی ئامادە بوان لە هەزار کەسیش تێپەڕی›.

▣ تجاوز جنسی: دەسدرێژی جنسی؛ سەرجێیی‌کردن لەگەڵ کەسێکدا بە زۆر.

تجاوز نظامی: دەسدرێژی چەکداری؛ بە زۆر و بە شێوەی چەکدارانە چوونە ناو خاکی وڵاتێکەوە.

**تجاوزکار** / tacāvozkār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. دەسدرێژکەر؛ دەسدرێژیکەر: **تجاوزگر**

**تجاوزگر** / tacāvozgar/: [عربی/ فارسی] ☜ **تجاوزکار**

**تجاهل** / tacāhol/: [عربی]/اسم. [ادبی] کار و کردەوەی خۆ لە نەزانی دان؛ خۆ لە گێلیدان ‹طوری تجاهل کرد فکر کردم نمی‌شنود: وا خوی لە نەزانی‌دا وام زانی نابیسێ›.

▣ تجاهل عارف: خۆگێل‌کردنی ئاگا؛ خۆ لە نەزانی دانی زانا.

**تجدد** / tacaddod/: [عربی]/اسم. نوێگەری؛ نۆباوی؛ نوێیەتی؛ تازەگەری؛ تازەگی؛ نەخوازە لە دیاردەکانی کۆمەڵایەتیدا.

**تجددخواهی** / tacaddodxāhî/: [عربی/ فارسی] ☜ **تجددطلبی**

**تجددطلبی** / tacaddodtalabî/: [عربی]/اسم. نوێخوازی؛ خوازیاری نوێگەری و کۆشش بۆ بە دەست هێنانی بار و دۆخی تازە: **تجددخواهی**

**تجدید** / tacdîd/: [عربی]/اسم. ١. کار و رەوتی نوێکردنەوە؛ تازەکردنەوە؛ تازەوەکەردەی ‹تجدید بنا: تازەکردنەوەی ساختمان› ٢. سەر لە نوێ؛ لە سەررا ‹تجدید مطلع: سەر لە نوێ دەسپێکردنەوە› ٣. تەژدید؛ نمرەی کەمتر لە رادەی پێویست بۆ سەرکەوتن لە ئەزموون ‹آرام امسال دو تا تجدید داشت: ئارام ئەمساڵ دوو تەژدیدی هەبوو›.

▣ تجدید انتخابات: هەڵبژاردنەوە؛ کار و رەوتی دەنگدان و هەڵبژاردن دووپاتە کردنەوە.

تجدید چاپ: لەچاپ دانەوە؛ دووپات کردنەوەی چاپی نووسراوەیەک کە پێشتر لە چاپ دراوە.

تجدید حیات: ژیانەوە؛ ژینەوە؛ ئەوەژیوەی.

تجدید روابط: نوێ کردنەوەی پێوەندی.

تجدید فراش: ژن هێنانەوە؛ ژن خواستنەوە؛ ژنەوە ئاردی.

تجدید قوا: ڤەژین؛ بووژانەوە؛ ژووژانەوە؛ گیان‌گرتنەوە؛ هازوەگیرتەی.

تجدید مطلع: ١. وتنەوە؛ قسە تازە کردنەوە؛ ئەوەواتەی؛ لە بارەی شتێکەوە کە پێشتر قسەکراوە، لە سەررا قسە کردنەوە ٢. دووبارەکردنەوەی بەشاوەند، لە بەرانبەر ناتەواو مانەوەی قسە یان تەنگی قیافەدا.

تجدید نظر: پێدا چوونەوە؛ چاو پیا خشاننەوە؛ دیتنەوە؛ ئەوەدیەی.

▣ تجدید داشتن: تەژدید بوون؛ هێنانی نمرەی کەمتر لە رادەی پێویست لە وانەیەکدا، کە نیازی بە ئەزموون دانەوەی دووبارەیە ‹آزاد امسال دو تا تجدید دارد: ئازاد ئەمساڵ دوو تەژدیدی هەیە›.

تجدید شدن: ١. دووپاتە بوونەوە؛ دووپات کرانەوە ‹انتخابات تجدید شد: هەڵبژاردن دووپاتە بوویەوە› ٢. تەژدید بوونەوە؛ بە دەسهێنانی نمرەی کەمتر لە ئەندازەی پێویست لە وانەدا.

**تجدیدشونده** / tacdîdšavande/: [عربی/ فارسی] صفت. تازەوەبووی؛ بە تایبەتمەندی یان لیهاتوویی بەرهەم هاتنەوە یان دیسان کەڵک لێ‌وەرگرتنەوە.

**تجدیدنظرطلب** / tacdîdenazartalab، ـان/: [عربی] صفت. پێداچوونەوەخواز؛ خوازیار یا لایەنگری پێداچوونەوە: **رویزیونیست**

تجدیدنظرطلبی / tacdîdenazartalabî/: [عربی]/اسم. پێدا چوونەوەخوازی؛ لایەنگری لە لێڕوانینەوە و هەڵسەنگاندنەوەی ڕێبازێکی ڕامیاری، ئامۆژەیەکی فەلسەفی یان ڕێخراوەیەکی حیزبی: **رویزیونیسم**

تجدیدی / tacdîdî، ـها/: [عربی]/اسم. تەژدیدی؛ قوتابیەک کە لە ئەزموونی وانەدا نمرەیەکی کەمتر لە ئەندازەی دیاریکراو بگرێ و ناچار بێ دیسانەوە ئەو دەرسە بخوێنێتەوە و ئەزموونی بداتەوە.

تجربه / tacrebe, tacrobe، ـها؛ تجارب؛ تجربیّات/: [عربی]/اسم. ئەزموون؛ ساوکە: ١. کار یان ڕەوتی ناسینەوە و پێزانینی هەر شتێک لە ماوەی ژیاندا ‹تجربەی زندگی در غربت را نداشتم: ئەزموونی لە غەریبیدا ژیانم نەبوو› ٢. کار یان ڕەوتی بەشدار بوونی تێکۆشەرانە لە ڕووداوگەل یان چالاکیگەلێک کە دەبنە هۆی لێزانی و کارامەیی ‹تجربەی کاری: ئەزموونی کاری› ٣. زانیاری؛ ئاگاداری یان لێزانییەک کە لەم ڕێگەوە بە دەست دێ ‹باید این حادثه برایت تجربەی خوبی شدە باشد: دەبێ ئەم کارەساتە بۆت بووبێ بە ئەزموونێکی باش› ٤. ئازمایش؛ ئەزموون؛ تاقی؛ هێچ ‹می‌توانی برای خودت تجربە کنی: دەتوانی بۆ خۆت ئەزموونی بکەی›.

▣ تجربە آموختن: ئەزموون وەرگرتن؛ فێر بوونی زانیاری لەمەڕ شتان و دیاردەگەلەوە لە ڕێگەی دیتن یان کار پێ کردنیان.

تجربە اندوختن: ئەزموون کۆکردنەوە؛ جەڕب کۆوەکردن؛ خڕکردنەوەی ئەزموون؛ گلێرکردنەوەی زانیاری و ئاگایی.

تجربە داشتن: ئەزموون هەبوون؛ بە ئەزموون بوون؛ ناسینەوەی دیاردە یان ڕووداوێک بە هۆی ئەزموون کردن لە پێشدا.

تجربە شدن: ١. ئەزموون کران؛ تاقی کرانەوە؛ تاقی بوونەوە ٢. بوونە ئەزموون؛ بە شێوەی زانیاریەکی زانستی دەرهاتن.

تجربە کردن: ئەزموون؛ جەڕباندن؛ تاقی کردنەوە؛ کرێشەیش؛ زمین.

تجربی / tacrebî, tacrobî/: [عربی] صفت. ئەزموونی: ١. پێوەندیدار بە ئەزموونەوە ‹علوم تجربی: زانستگەلی ئەزموونی› ٢. ئەزموونانە؛ بە دەس هاتوو لە ڕێی ئازمایش یان کارەوە ‹معلومات تجربی: زانیاریگەلی ئەزموونی›.

تجربیات / tacrebîyyāt, tacrobîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **تجربه**

تجرد / tacarrod/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ١. سەڵتی؛ ڕەبەنی؛ بێهاوسەری؛ دۆخ یان چۆنیەتی هورم بوون ‹او هنوز در تجرد به سر می‌برد و ازدواج نکرده است: هێشتا لە سەڵتیدایە وهاوسەری نەگرتووە› ٢. *[نامتداول]* تەنیایی؛ یەکلەیی ٣. *[تصوف]* تەرکە دنیایی؛ چۆناوچۆنی دەست لە دنیا بەردان و تەک بە لای خوداوە دان.

تجری / tacarrî/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* بێپەروایی؛ بێشەرمی؛ ڕووداماڵیاگی؛ گوساخی؛ گۆسارتمەیی.

تجرید / tacrîd/:[عربی]/اسم. تەڵکەری؛ هەلوەژێری؛ هەڵبژاری؛ کار یان ڕەوتی جیا کردنەوەی شتێک، بەتایبەت چەمکێک، بۆ لێکدانەوە و هەڵسەنگاندنی جیاوازانەی.

تجریدی / tacrîdî/:[عربی] صفت. ١. هەڵبژارانە؛ پێوەندیدار بە هەڵوەژێریەوە ٢. هەڵبژێراو؛ هەلوەژێراو؛ تەلکراو؛ ڕووتکراو.

تجزیه / tacziye، ـها/:[عربی]/اسم.

شی کراوه‌یی؛ لێک کراوه‌یی: ١. جیایی پاژگەلی شتێک لە یەکتری ٢. [شیمی] کار یان ڕەوتی لێک هەڵاوەردنی ماکی لێکدراو بە تەنگەلی سادەترێ کە تێیدان ٣. کار یان ڕەوتی جیاکردنەوەی بەشێک لە شتێک.

⊡ **تجزیه‌ی ادرار:** هێچاندنی میز لە باری پێکهاتەکان و تێکەڵیەکانیەوە بۆ دۆزینەوەی هۆی ناساغی. هەروەها: **تجزیه‌ی خون**

**تجزیه‌تحلیل** ☜ **تجزیه و تحلیل**

**تجزیه‌طلبی** / tacziyetalabî/: [عربی] ☜ **جدایی‌خواهی**

**تجزیه و تحلیل** / tacziye-vo-tahlîl، ـها/: [عربی]/اسم. کڕ و کاش؛ تێک و لێک؛ کار یان ڕەوتی لێکدانەوەی پاژگەل و توخمگەلی چەمکێک بۆ بە دەس‌هێنانی زانیاری یان ئەنجامی گشتی: **تجزیه‌تحلیل**

**تجسد** / tacassod/:[عربی]/اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی بە دەس‌هێنانی پەیکەر یان کەلەستە.

**تجسس** / tacassos، ـها؛ ـات/:[عربی]/اسم. گردی‌سەر؛ کوڵک و مووش؛ کنە؛ کار یان ڕەوتی پشکان؛ گەڕان؛ دانە پەی ‹همه‌ی سوراخ سنبه‌ها را به جستجوی اسلحه تجسس کردند: هەموو کون‌وقوژبنیان بە شوێن چەکدا پشکاند›.

**تجسم** / tacassom، ـها؛ ـات/:[عربی]/اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی هێنانە بەر چاو؛ وێنەی زەینی شتێ کە هەبوونی دەرەوەیی نیە یان نیە لە بەر دەستدا ‹تجسم چهره‌ی دزد: هێنانە بەرچاوی وێنەی دز›.

⊡ **تجسم بخشیدن:** هێنانە بەر چاو: **به تجسم درآوردن**

**تجسم یافتن:** هاتنە بەر چاو؛ هاتنە پێش چاو.

**به تجسم درآوردن** ☜ **تجسم بخشیدن**

**تجسمی** / tacassomî/:[عربی] صفت. ١. پێوەندیدار یان سەر بە ڕەوتی هێنانە بەر چاوەوە ٢. بە توانایی یان تایبەتمەندی هێنانە بەرچاوەوە.

⊡ **هنر تجسمی** ☜ **هنر**

**تجلی** / tacallî، ـها؛ ـات/:[عربی]/اسم. [ادبی] دیاردی؛ خویایی.

⊡ **تجلی کردن:** درەوشانەوە؛ دەرکەوتن؛ زیەی؛ زیای؛ دیاردی دانی شتێکی درەوشاوە (وەک هەتاو): **تجلی یافتن**

**تجلی یافتن** ☜ **تجلی کردن**

**تجلید** / taclîd/: [عربی]/اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی بەرگ (تێ) گرتن یان خستنە ناو بەرگەوە ‹بودجه‌ای برای تجلید کتابها اختصاص یافت: بووجەیەک بۆ بەرگ‌گرتنی کتێبەکان تەرخان کرا›.

**تجلیل** / taclîl/: [عربی]/اسم. ڕێزگری؛ کار یان ڕەوتی ڕێز لێنان؛ خەمناندن؛ گەورە کردن؛ قەدرگرتن.

**تجمع** / tacammo'، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. [ادبی] پسات؛ جڤین؛ کار یان ڕەوتی کۆ بوونەوە؛ خڕ بوونەوە؛ گرد بوونەوە: ١. لە جێیەکدا گلێر بوونەوە ‹از تجمع افراد در برابر سفارتخانه جلوگیری شد: لە کۆ بوونەوەی خەڵک لە بەرانبەر باڵوێزخانەدا بەرگیری کرا› ٢. گهان؛ بەراڤی ‹در تجمع دانشجویان اعمال خشونت محکوم شد: لە کۆ بوونەوەی خوێندکاراندا بە کار هێنانی زەبر و زووری ترۆ کرا›.

**تجمل** / tacammol، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ڕەوش؛ ئەوەی بۆ زۆرکردنی جوانی و تەکووزی بە کار دەڕوات ‹برای عروسی آنها این همه تجمل لازم نبود: بۆ زەماوەندی ئەوان

ئەم هەموو ... ـەیە پێویست نەبوو›.

**تجملات** / tacammolāt/: [عربی]/اسم. زەرقوبەرق؛ شتانێ کە تەنیا بۆ ڕانانی سامان یان شکۆ و گەورەیی بە کار دێن.

**تجمل پرست** / tacammolparast، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. شکۆپەرست؛ زەرقوبەرقی؛ خوازیاری ڕانانی سامان و شکۆ. هەروەها: **تجمّل پرستی**

**تجملی** / tacammolî/: [عربی] صفت. ڕەوشی؛ لووکس: ١. پێوەندیدار بە ڕەوشەوە ‹کالای تجملی: پیتەوای ڕەوشی› ٢. ڕەوشدار؛ بە سامان و شکۆ ‹زندگی تجملی: ژیانی ...›.

**تجنیس** / tacnîs، ـها/: [عربی]/اسم. ١. *[ریاضی]* هاوجنسکاری؛ کار یان ڕەوتی کۆ کردنەوەی ژمارەیەکی ساغ لەگەڵ ژمارەیەکی شکاودا ٢. ☜ **جناس**

**تجوید** / tacvîd/: [عربی]/اسم. تەجوید؛ زانستی ڕاست و دروست خوێندنەوەی قورئان.

**تجویز** / tacvîz، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی نواندن؛ حەلاڵ کردن؛ ڕێگەدان؛ بەرایی دان یان بە ڕەوا زانین.

◘ **تجویز کردن**: ١. بەرایی دان؛ ئیزن دان ٢. دانان؛ نووسین؛ نواندن؛ فەرمانی دەرمانی کە بژیشک بە نەخۆشی دەدا ‹رفته بودم پیش دکتر، برایم استراحت تجویز کرد: ڕۆیشتم بۆ دوکتۆر، پشووودانی بۆ دانام›.

**تجویف** / tacvîf/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* بۆشایی؛ کلۆرایی؛ هەڵۆلی؛ شاشی؛ چۆلاتی نێوان چەن تۆ.

**تجهیز** / tachîz/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی تەیارکردن؛ تەکووزکردن؛ بەرهەفکردن؛ گیفکرن؛ کەرستە پێدان ‹بیمارستان شهر برای پذیرش بیماران تجهیز شد: نەخۆشخانەی شار بۆ وەرگرتنی نەخۆشان تەیار کرا›.

**تجهیزات** / tachîzāt/: [عربی]/اسم. کەرستە؛ ئامێر؛ ئەوەی بۆ کارێک (شەڕ، سەفەر) پێویستە ‹تجهیزات نظامی: کەرەستەی چەکداری›.

**تجیر** / tacîr، ـها/: /اسم. چیخ؛ چیغ؛ هەتان؛ تامان؛ چەپەر؛ تەیمان؛ تەیمانە؛ هەڕە؛ وارش؛ دیوارۆکەی لە چیتک و جەگەن، تیکە چێوی ناسک، ئالۆمینیوم یان لاستیک و... بۆ جوێ کردنەوەی کاتی بەشێ لە جێگایێک.

**تحاشی** / tahāšî، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* سەرپێچی؛ ملنەدەری؛ خۆلادەری؛ کار یان ڕەوتی خۆ پاراستن لە وەرگرتنی شتێک یان ئەنجامدانی کارێک ‹آن مرد همواره تحاشی می‌کرد و دعوت او را نمی‌پذیرفت: ئەو پیاوە هەر سەرپێچی دەکرد و داوەتەکەی قەبووڵ نەدەکرد›.

◘ **تحاشی کردن**: ١. سەرپێچی کردن؛ مل نەدان؛ خۆ لادان ٢. حاشاکردن؛ نەچوونە ژێر بارەوە.

**تحبیب** / tahbîb/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ڕەوتی هەبانەن؛ دلۆڤانی بۆ دڵ بەدەس هێنان؛ دڵدانەوە و وەخۆگرتنی دۆستی.

**تحت** / tahte/: [عربی] حرف. ژێر؛ دەژێر؛ چێر؛ بن؛ خوار؛ دە بەرانبەر یان لە ژێر شتێکدا.

◘ **تحت امر**: ژێر دەست؛ ژێر فرمان ‹افراد تحت امر را جمع کنید: کەسانی ژێر دەست کۆکەنەوە›.

تحت پیگرد: قاچاخ؛ کەسێ کە خۆی شاردۆتەوە و بە دوایدا دەگەڕێن: **تحت تعقیب**

تحت تأثیر: لە ژێر کارتێکەری؛ لە بەر تاو؛ لە بەر کارتێکەری شتێکدا ‹تحت تأثیر

حرفهای مادرش قرار گرفته است: کەوتۆتە ژێر کارتیکەری قسەکانی دایکیەوە›.

**تحت تعقیب** ☜ **تحت پیگرد**

**تحت تکفّل:** دەژێر سەرپەرشتی؛ لە بەر حەواوینی ‹او هنوز تحت تکفل پدرش زندگی می‌کند: ئێستاش دەژێر سەرپەرشتی باوکیدا دەژی›.

**تحت توجهات:** لە ژێر چاوەدێری؛ لە بەرانبەر پێراگەیشتنەوە ‹این مدرسه تحت توجهات ادارەی آموزش و پرورش پیشرفت خوبی کرده است: ئەم قوتابخانەیە لە ژێر چاوەدێری مەزرینگەی فێرکاری و بارهێناندا باش چۆتە پێشەوە›.

**تحت رهبری:** بە سەرۆکایەتی؛ بە ڕێبەرایەتی.

**تحت سرپرستی:** لە ژێر سەرپەرشتی؛ چێروو یانەوانی؛ بە سەرپەرشتی کەسێک یان بنکەیەک.

**تحت فشار:** دەژێر گوشار؛ لە بەر تەوژم؛ هەل‌گوڤاشتی ‹آبیاری تحت فشار: ئاودێری دەژێر گوشار›.

**تحت مسئولیت:** بە لێپرسراوی؛ لە ژێر بەرپرسیەتی؛ لە بەرپرسایەتی ‹این شرکت تحت مسئولیت شما اداره می‌شود: ئەم بەشدراگەیە بە لیپرسراوی ئێوەوە بەڕێوە دەچێ›.

**تحت نظر:** لە ژێر چاوەدێری؛ نەترنایش؛ خانەشاری ‹بعد از زندان مدتی تحت نظر بوده است: دوای زیندان ماوەیەک لە ژێر چاوەدێریدا بووە›.

**تحت‌الارضی** / tahtol'arzî/:[عربی] *صفت.* *[قدیمی]* ژێرزەوینی؛ چێرەزەمینی.

**تحت‌الحفظ** / tahtolhefz/:[عربی] *قید.* وێرای نگاوان؛ وێرای چاودێرێ ‹او را گرفتند و تحت‌الحفظ بردند: گرتیان و وێرای چاودێری بردیان›.

**تحت‌الحمایه** / tahtolhemāye، ـها/: [عربی] *صفت.* ١. *[نامتداول]* لە ژێر پشتیوانی؛ خاوەن پشتیوان ٢. خاوەن فەرمانڕەوا و دەسەلاتی ناوخۆ، بەبێ مافی بەشداری لە پەیوەندی لەگەڵ ولاتانی‌تردا.

**تحت‌الشعاع** / tahtoššo'ā'/: [عربی] *قید.* لە ژێرکاریگەری؛ لە ژێرکارتێکەری؛ لە بەر شوێنەواری کار یان دیاردەیەکی بەهێزتردا.

**تحت‌اللفظی** / tahtollafzî/: [عربی] *صفت.* دەق‌بەدەق؛ دەقاودەق؛ وشەبەوشە ‹ترجمەی تحت‌اللفظی: وەرگێڕانی دەق‌بەدەق›.

**تحتانی** / tahtānî/: [عربی] *صفت.* ژێرین؛ خوارین؛ ژێروو؛ چێرین؛ لە ژێر یان خوارەوە ‹طبقەی تحتانی: نهۆمی ژێرین›.

**تحجر** / tahaccor/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* ڕەقی؛ کەڤری؛ کار یان ڕەوتی سفت و سەخت بوونەوە (وەکوو بەرد).

▣ تحجر فکر: مێشک وشکی.

**تحدب** / tahaddob، ـها/: [عربی] *اسم.* کۆمی؛ قووزی؛ کووڕی.

**تحدث** / tahaddos/: [عربی] *اسم.* *[قدیمی]* وتەبێژی؛ کار یان ڕەوتی قسەکردن و خەبەردان لە مەبەستێک.

**تحدید** / tahdîd/: [عربی] *اسم.* کار یان ڕەوتی دیاریکردن و سنوور دانان؛ کەوشەن دیاری‌کردن.

▣ تحدید حدود: کلیدەبەنی؛ کەوشەنڕێژی؛ کار یان ڕەوتی سنوور دانان؛ پەرێز دیاری‌کردن.

**تحذیر** / tahzîr/: [عربی] *اسم.* ئاگاداری؛ کار یان ڕەوتی ئاگادارکردن؛ های دان.

**تحرک** / taharrok، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* ١. جم و جووڵ؛ هەڵسووڕ؛ گلگەوەز؛

کار یان ڕەوتی هەڵسووڕان؛ بزووتن ‹جوان باید تحرک داشته باشد: لاو دەبێ جم و جووڵی هەبێ› ٢. چالاکی (بەتایبەت درێژەدار و بێوچان) ‹تحرک سیاسی: چالاکی ڕامیاری›.

**تحریر** / tahrîr/: [عربی]/اسم. ١. کار یان ڕەوتی نووسین ٢. /موسیقی/ چڕین؛ هۆرە؛ چەهچەهە؛ هەڵەنگووتنی ئاواز دەگەرووڕا ٣. /قدیمی/ ویرایش؛ ئیدیت؛ کار یان ڕەوتی پێداچوونەوەی ورد و هەڵەگرتن.

▣ **تحریر ترکە**: /حقوق/ کەلەپوور برین؛ دیاریکردنی ئەوەی لە مردوو بەجێماوە.

▣ **تحریر دادن**: ئاواز دەگەروودا هەڵەنگووتن.

**تحریر کردن**: نووسین؛ نڤیسین؛ نویسەی؛ نیستەی.

**تحریری** / tahrîrî/: [عربی] صفت. نووسینی؛ پێوەندیدار یان سەر بە نووسینەوە.

**تحریریه** / tahrîrîyye/: [عربی] ☜ هیئت تحریریّه، **هیئت**

**تحریص** / tahrîs/: [عربی]/اسم. /ادبی/ کار یان ڕەوتی خستنە هەڵگەوە؛ بەتەما خستن؛ هەڵخراندنی واز و ئەنگیزە لە کەسێکدا ‹زنش او را به رفتن از آن خانه تحریص می‌کرد: ژنەکەی بۆ چوون لەو ماڵە خستبوویە هەڵگەوە›.

**تحریض** / tahrîz/: [عربی]/اسم. /ادبی/ کار یان ڕەوتی هەڵبزواندن؛ زیخاندن؛ هەڵخڕاندن بە مەبەستێکی نەگونجاو.

**تحریف** / tahrîf/، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی هەڵگەڕاندنەوە؛ وەرگەڕاندنەوە؛ بەراوەژووکردنەوە؛ گۆڕاندنی واتا یان ناوەڕۆکی قسە (نووسراوە)ی کەسێک ‹معنی آیه تحریف شده است: مانای ئایەتەکە وەرگەڕاوە›.

**تحریک** / tahrîk/، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. هان؛ دنە؛ هانە؛ هانە_هانە؛ فیت؛ زاخ؛ تور؛ فچک؛ کار یان ڕەوتی زیخان؛ هێزان؛ هێژان؛ ئالووز؛ هەڵزرنگان؛ هەڵزرنگیان؛ هەڵخران؛ بزاوتن؛ هاژۆتەی؛ هێرین؛ سیخدان؛ هەڵخڕاندنی گیاندار بە کارێک ‹تلویزیون‌های بیگانه مخالفان را به شورش تحریک می‌کردند: تەلەڤیزیۆنە بیانییەکان نەیارانیان بەرەو ڕاپەڕین هان دەدا› ٢. /نامتداول/ کار یان ڕەوتی بزاواندن؛ تووڕانن؛ جووڵاندن؛ خستنە زیخەوە.

**تحریک‌آمیز** / tahrîkāmîz/: [عربی/ فارسی] صفت. دنەدەر؛ هاندەرانە؛ هەڵخڕێنەرانە؛ بە هۆکارگەلێ کە دەبنە هۆی دنە و هاندانەوە ‹سخنان تحریک‌آمیز: وتەگەلی دنەدەر›.

**تحریک‌پذیری** / tahrîkpazîrî/: [عربی/ فارسی]/اسم. هەڵزرنگاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هەڵزرنگیان و بزوان لە بەرانبەر هاندەرەوە. هەروەها: **تحریک‌پذیر**

**تحریم** / tahrîm/، ـها/: [عربی]/اسم. ڕەوتی بە ناڕەوا زانینی کارێک و ئەنجام نەدانی ئەو کارە؛ حەرامکردن؛ پاوانکردن؛ هەمانەدن ‹تحریم کالاهای خارجی: حەرامکردنی پێتەواگەلی بیانی›.

▣ **تحریم اقتصادی**: پاوانکاری ئابووری؛ کار یان ڕەوتی بە ناڕەوا دەرکردن و قەدەغە کردنی هەر چەشنە کەین و بەینی ئابووری لەگەڵ لایەن یان لایەنەکانی‌تردا. هەروەها: **تحریم سیاسی؛ تحریم تسلیحاتی؛ تحریم اطلاعاتی**

**تحزّب** / tahazzob/: [عربی]/اسم. حیزبایەتی؛ دەستەبەندی؛ هەبوونی حیزب و ڕێخراوەگەلی ڕامیاری.

**تحسّر** / tahassor/: [عربی]/اسم. /ادبی/ داخ؛ مخابن؛ خەمی سەرچاوەگرتوو لە پەرۆشی.

**تحسین** / tahsîn/: [عربی]/اسم. پەسن؛ ستایش؛ باریقەلایی؛ ڕەوش؛ کار یان ڕەوتی

پێدا هەڵگوتن.

**تحشیه** / tahšiye/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ١. پەراوێزنووسی (بۆ نووسراوەیەک) ٢. کار یان ڕەوتی زێوار تەوزاندن؛ زێوار ڕازاندنەوە؛ جوانکاری دەوراندەوری پەڕەی نووسراوە.

**تحصل** / tahassol/: [عربی]/اسم. بار یان دۆخی دابین بوون؛ بەرهەم هاتن؛ بەدیهاتن؛ وە بەرهاتن؛ ئابووران.

**تحصن** / tahasson/: [عربی]/اسم. گە؛ گەد؛ هۆک؛ جەنە؛ هەرم؛ هەڕن؛ کاری لە شوێنێک دانیشتن و خۆ مات دان.

◘ **تحصن کردن**: گەگرتن؛ هۆک کردن؛ هەرمین؛ جەنەگرتن؛ هەرنین ‹دانشجویان در مسجد دانشگاه تحصن کردەاند: قوتابیان لە مزگەوتی زانسگادا گەیان کردووە›.

**تحصیل** / tahsîl، ـات/: [عربی]/اسم. ١. هین؛ کار و ڕەوتی خوێندن؛ وەنەی؛ وانەی؛ فێرە زانست بوون ‹تحصیل علم: خوێندنی زانست› ٢. کار یان ڕەوتی بەدەست هێنان؛ بە دەس ئاردەی ‹تحصیل ثروت: بە دەس هێنانی دارایی›.

◙ **تحصیل حاصل**: کار یان ڕەوتی بە دەست هێنانی شتێ کە پێشتر بە دەست هاتووە.

◘ **تحصیل، حاصل شدن**: بە ئامانج گەیشتن؛ دەسکەوتنی ئەوەی کە خوازراوە.

**تحصیل کردن**: ١. خوێندن؛ هەڤۆتن وانتەی؛ وەنەی ‹او هنوز تحصیل می‌کند: هێشتا دەخوێنێ› ٢. *[نامتداول]* بە دەس هێنان.

**تحصیلات** / tahsîlāt/: [عربی]/اسم. ١. خوێندەواری؛ ئەوەی لە دامەزراوەیەکی هینکاریدا بە دەس هاتووە ‹از تحصیلات داماد سوآل کردم: لەمەڕ خوێندەواری زاوا پرسیارم کرد› ٢. خوێندن؛ هەڤۆت؛ هووین؛ هین ‹تحصیلات ابتدایی: خوێندنی سەرەتایی›.

◙ **تحصیلات تخصصی**: هەڤۆتی تایبەتی؛ هووینی تایبەت بۆ بە دەسهێنانی پسپۆڕی.

**تحصیلات تکمیلی**: خوێندنی سەرەکی؛ هەڤۆتی دوایی؛ هەڤۆتی خوێندکاری سەرتر لە پلەی کارناسی.

**تحصیلات عالی**: خوێندنی بالا؛ هەڤۆتی سەرەکی.

**تحصیلدار** / tahsîldār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. کەسێ کە کاری وەرگرتن و کۆکردنەوەی پارەی دامەزراوەیەکە. هەروەها: **تحصیلداری**

**تحصیلکرده** / tahsîlkarde، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *صفت*. خوێندەوار؛ خوەنەوار؛ خۆنەوار؛ خاوەن خوێندن و هەڤۆتی زانستی (لای کەم تا پلەی دواناوەندی).

**تحصیلی** / tahsîlî/:[عربی] *صفت*. فێرکاری؛ هەڤۆتی ‹سال تحصیلی: ساڵی فێرکاری›.

**تحف** / tohaf/: [عربی] جمعِ ☜ **تُحفه**

**تحفه** / tohfe، ـها؛ تُحَف/: [عربی]/اسم. دیاری: ١. سەوقاتی؛ قوتحە؛ سۆقات؛ دەساویز ‹بفرمایید، تحفه‌ی شهر ماست: فەرموون، دیاری شاری ئێمەیە› ٢. پێشکەشی ‹اختر خانم تحفه آوردە است: ئەختەر خانم دیاری هێناوە› ٣. ☜ **تحفه‌ی نطنز**

◙ **تحفه‌ی نطنز**: *[تعریض]* شتی ناوازە و بە بایەخ؛ شتەپوختە (زۆرتر بۆ گاڵتە و سووکایەتی بە کار دەڕوا): **تحفه‌ـ٣**

**تحقق** / tahaqqoq/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی بەدیهاتن؛ هاتنەدی؛ ڕێککەوتنی ویست یان ئاواتێک ‹برای تحقق خواستەهای خود تلاش می‌کنیم: بۆ بەدیهێنانی

داخوازیەکانمان تێدەکۆشین›.

**تحقیر** / tahqîr، ـها/: [عربی]/*اسم*. کووره؛ سووکایەتی؛ کار یان ڕەوتی سووککردن یان بە سووک زانین؛ بچووککردنەوە ‹با این رفتارت مرا تحقیر کردی: بەم ئاکارەت منت سووک کرد›.

**تحقیرآمیز** / tahqîrāmîz/: [عربی/فارسی] *صفت*. سووککەرانە؛ وێرای ئەوەی دەبێتە هۆی سووکی.

**تحقیق** / tahqîq، ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم*. دپیەک؛ نون؛ بنگیری؛ کار یان ڕەوتی تۆژینەوە؛ توێژینەوە؛ لێکۆڵینەوە؛ هلکەوشان: ١. داباش؛ پەیدۆزی؛ منیێ؛ کار یان ڕەوتی هوورانەدن؛ فەتاندن ‹دربارەی آبهای زیرزمینی تحقیق می‌کند: لە مەڕ ئاوگەلی ژێر زەوییەنەوە داباش دەکا› ٢. ڕەوتی لێکۆڵینەوە؛ ڤیکەتن؛ پرس‌وجۆ ‹تحقیق پلیس از شاهدان ادامە دارد: لێکۆڵینەوەی پۆلیس لە گەڤاهەکان درێژەی هەیە›.

**تحقیقاتی** / tahqîqātî/:[عربی] *صفت*. داباشی؛ لێکۆڵینەوەیی؛ توێژینەوەیی؛ تۆژینەوەیی ‹آزمایشگاه تحقیقاتی: ئازمایشگەی داباشی›.

**تحقیقی** / tahqîqî/: [عربی] *صفت*. داباشیانە؛ دپیەکی؛ لێکۆڵینەوەییانە؛ تۆژینەوەیانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە لێکۆڵینەوەوە ‹مقالەی تحقیقی: وتاری داباشیانە›.

**تحکم** / tahakkom، ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم*. ئاکار یان گوتاری ڕەسمی، بە داخوڕین بۆ هەڵپێچان و ناچارکردنی دیتران بە فەرمانبەری.

**تحکم‌آمیز** / tahakkomāmîz/: [عربی/فارسی] *صفت*. بە داخوڕین ‹رفتار تحکم‌آمیز: ئاکاری بە داخوڕین›.

**تحکیم** / tahkîm/: [عربی]/*اسم*. پتەوکاری؛ کار یان ڕەوتی پتەو یان پایا کردنەوە.

**تحلیف** / tahlîf/: [عربی]/*اسم*. کار یان ڕەوتی سوێند خواردن.

**تحلیل** / tahlîl/: [عربی]/*اسم*. ١. /ـها/ ڕەوتی لێکدانەوە؛ شیکردنەوە؛ گیر و گرفتی بابەتێک ناسین و لێ ورد بوونەوەی ‹تحلیل مواضع احزاب سیاسی: لیکدانەوەی هەڵوێستەکانی ڕێخراوەگەلی رامیاری› ٢. *[نامتداول]* کار یان ڕەوتی توانەوە و وردەوردە پووچانەوەی تەنێک ٣. هەڵتاوین؛ گەوارشی خواردەمەنی ٤. ڕەوتی کەم بوونەوەی بەرەبەرەیی؛ پەڕپتین؛ چوونەکار؛ هندکینی هەندی.

▣ **تحلیل غذا**: هەڵتاوین؛ گەوارش؛ هەزمی خواردەمەنی.

**تحلیل قوا**: داهێزرانی هێز؛ وردەوردە توانەوەی قەوەت.

**تحلیل کمی**: لێکدانەوەی شتێک لە بواری چەندیەتەوە. هەروەها: **تحلیل کیفی**

▣ **تحلیل رفتن**: ١. هندکین؛ کەم بوونەوە؛ دابەزینەوە؛ چوونە ئاو ٢. هەڵتاوین؛ هەزم بوون.

**تحلیل کردن**: لێکدانەوە؛ لە یەکدانەوە؛ شیکردنەوە؛ هلکەواشتن.

**تحلیل یافتن**: هندکین؛ کەم بوونەوە؛ دابەزین؛ پەڕپتین.

**تحلیلگر** / tahlîlgar، ـها؛ ـان/: [عربی/فارسی] /*اسم*. شیکار؛ هێرەکار؛ لێکدەرەوە؛ کەسێ کە بابەتێ یان ڕووداوێ لە ڕووی پاژەکانیەوە لێکدەداتەوە.

**تحلیلی** / tahlîlî/: [عربی] *صفت*. ١. لێکدانەوەیی ٢. لێکدانەوەییانە؛ شیکارانە.

**تحلیل‌یافته** / tahlîlyāfte/: [عربی/فارسی] *صفت*. *[زیست‌شناسی]* داکەوتوو؛ تواوە؛ وردەوردە لە ناوچووگ ‹دم تحلیل‌یافته:

کلکی داکەوتوو›.

**تحمل** / tahammol/: [عربی]/اسم. ۱. کار یان ڕەوتی هەڵگرتن؛ توانایی بۆ پەزێرانی قورسی یان شوێنەوارگەلی شتێک ‹این سقف می‌تواند ۱۰ تن سنگینی را تحمل کند: ئەم میچە دەتوانێ ۱۰ تون قورسی هەڵگرێ› ۲. توان؛ تاقەت؛ تابشت؛ خۆڕاگری؛ لەسەرخۆیی؛ تەشە؛ پشوودرێژی ‹تحمل دیدن اشکهای تو را ندارم: تاقەتی دیتنی فرمێسکەکانتم نیە›.

▣ تحمل کردن: ۱. وەستان؛ بەرگەگرتن؛ بەرگرتن؛ هەڵکردن؛ هەڵگرتن؛ هۆرکەردەی ۲. خۆ ڕاگرتن؛ تاقەت هاوردن. هەروەها: **تحمل داشتن**

**تحمیق** / tahmîq/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی خاپاندن؛ گەوجاندن؛ کەرکردن یان هەڵپێچانی دیتران بە کردنی کاری گەوجانە.

**تحمیل** / tahmîl، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. سەپان؛ داسەپان؛ دالەپین: ۱. کار یان ڕەوتی گرانی یان گوشارێک خستنە ئەستۆی کەسێکەوە ‹خرج عیاشیهایش را هم بە آن بیچارە تحمیل می‌کرد: مەزاخی شەپانیەکانیشی بە سەر ئەو داماوەدا دەسەپاند› ۲. قورسی یان گوشارێ کە بە شێوەیەکی نەخوازراو دێتە سەر کەسێکدا ‹در برابر تحمیلهای ناروا مقاومت می‌کرد: لە بەرانبەر داسەپاوەگەلی ناڕەوا باشاری دەکرد›.

▣ تحمیل کردن: داسەپاندن؛ ئەرەسەپنەی؛ سەپاندنی کارێک بە سەر کەسێکدا بە تۆبزی.

**تحمیلی** / tahmîlî/: [عربی] صفت. داسەپێنراو؛ ئەرەسەپیا ‹جنگ تحمیلی: شەڕی داسەپێنراو›.

**تحول** / tahavvol، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. گۆڕانکاری؛ هەڵوەگۆڕی؛ بارەوباری.

▣ تحول یافتن: گۆڕان؛ بارەوبار بوون.

**تحویل** / tahvîl/: [عربی]/اسم. ۱. ڕادەست؛ وەقەرە؛ کار یان ڕەوتی ئەسپاردنی شتێ بە کەسێ یان شوێنێک بە شێوەی ڕەسمی ۲. *[نجوم]* ڕەوتی گواستنەوە و گۆزانەوەی گەرۆکێکی ئاسمانی لە برجێکەوە بۆ برجێکی‌تر.

▣ تحویل سال: سەرەتای سالی هەتاوی؛ دەسپێکی بەهار لە نیمەگۆی باکووریدا.

**تحویلدار** / tahvîldār، ـها؛ ـان/: [عربی/فارسی]/اسم. سنۆقدار؛ کەسێ کە کاری وەرگرتنی دارایی (بەتایبەت نەختینەی) دامەزراوەیەک و پاراستنی وەئەستۆیە.

**تحویلداری** / tahvîldārî/: [عربی/فارسی]/اسم. سنۆقداری؛ پیشە یان کاری سنۆقدار.

**تحویلی** / tahvîlî/: [عربی] صفت. سپاردراو؛ سپێردراو؛ دراو ‹پولهای تحویلی را بشمارید: پارە سپێردراوەکان بژێرن›.

**تحیات** / tahîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **تحیّت**

**تحیت** / tahîyyat، ـها؛ تحیّات/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* درووود؛ سەلام؛ سلاو؛ سلام؛ سلاڤ. هەروەها: **تحیت گفتن**

**تحیر** / tahayyor/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* سەرسامی؛ حەپەساوی؛ سەرسووڕماوی؛ ماتی؛ هەوەسیاگی؛ واق‌وڕی؛ واق‌وڕماوی؛ حەیرانی؛ هاژی؛ هاجی؛ هەم‌گمی؛ هوولی؛ سەرلێ‌شێواوی ‹از آن همه آشفتگی دستخوش تحیر شدم: لەو هەموو ئاشۆیە تووشی سەرسووڕمان هاتم›.

**تخار** / taxār/: /اسم. تەخار: ۱. هۆزی ئاریایی نیشتەجێی باکووری ئەفغانستان کە لە بەر پەلامار و هێرشی پەیتاپەیتای هۆزگەلی مەغول و ترک و بە هۆی

کۆچبەری یان تێکەڵییان لەگەڵ ئەواندا نەمان و فەوتان ٢. /ـها/ هەرکام لە کەسانی ئەو هۆزە.

**تخاری** / taxārî/: *اسم.* تەخاری؛ زمانی هۆزی تەخار، لە زمانگەلی هێند و ئورووپایی، کە نووسراوەگەلێک بەو زمانە لە سەدەکانی ٦و ٧ی زایینیدا لە بەر دەستدایە.

**تخاصم** / taxāsom، ـات/: [عربی] *اسم. [ادبی، نامتداول]* ڕقەبەرایەتی؛ دوژمنایەتی؛ دژایەتی؛ دوژمنی لەگەڵ یەکتریدا.

**تخالف** / taxālof/: [عربی] *اسم. [ادبی، نامتداول]* سەرپێچکاری؛ ناتەبایی و ناکۆکی لەگەڵ یەکتریدا.

**تخت** / taxt، ـها/: *اسم.* تەخت: ١. کورسی؛ کەت؛ ئەسکەملێکی تایبەت بۆ دانیشتنی شا لە کات‌وساتی ڕەسمیدا ٢. ژێرە؛ بەشی ژێرووی کەوش. بەرانبەر: **رویه** ٣. *[گفتاری]* چەرپا؛ چرپا؛ تەختی نووستن.

◘ **تخت بیمارستان**: چەرپای نەخۆشخانە؛ تەختێکی تایبەت بۆ حەوانەوەی نەخۆش لە خەستەخانەدا.

**تخت سینه**: *[گفتاری]* سەر سینە؛ تەختی سنگ؛ ڕووی سنگ؛ پانایی سینە؛ تەختوو سینەی ‹زد بە تخت سینه‌اش: دای بە سەر سینەیدا›.

**تخت عمل**: تەختی نەشتەرکاری؛ چەرپایەک کە نەخۆشی بە سەرەوە نەشتەرکاری دەکەن.

**تخت مرده‌شورخانه/ غسالخانه**: تاتەشۆر؛ تاتەشوار؛ تەتەشۆر؛ ئەو سەکۆیە کە مردووی بە سەرەوە دەشۆن.

◘ **تخت انداختن**: سانال کردن؛ ژێرە لێخستن؛ بەشی ژێرووی پێڵاو گۆڕین.

**تخت گاز رفتن**: پڕگاز ڕۆیشتن؛ بە خێراییەکی زۆرەوە ئاژۆتن؛ تەختەگاز چوون.

**بر تخت نشستن**: *[مجازی]* نیشتنە سەر تەختەوە؛ بوونە پاتشا؛ گەیشتنە پاشایی.

**تخت**[2]: *صفت. [گفتاری]* تەخت: ١. ڕاست؛ ڕاس؛ ساف ‹بشقاب لب تخت: دەوری زێوار تەخت› ٢. *[مجازی]* خاترجەم؛ ڕاحەت؛ ئاسوودە؛ دڵنیا؛ ئارخەیان ‹خیالت تخت باشد: خاترجەم بە›.

**تختال** / taxtāl، ـها/: *اسم. [زمین‌شناسی]* تەختایی؛ گۆڕەپان؛ گردێک کە سەرەکەی نەرمان و بنەکەی ڕەقانە و لە سۆنگەی سوانەوەوە دەبێتە تەختان.

**تختان** / taxtān، ـها/: *اسم. [زمین‌شناسی]* تەختان؛ گوهۆڕ؛ گۆڕ؛ گۆڕایی؛ مەخەر؛ نەرمان؛ زەوینی ڕێک و تا ڕادەیەک هەموار لە لێواری ڕووبار یان لە زێواری دۆڵێک.

**تخت‌پایی** / taxtpāyî/: *اسم. [پزشکی]* چۆنیەتی ساف بوونی ژێر پێ.

**تختخواب** / taxtexāb، ـها/: *اسم.* چەرپا؛ چرپایە؛ چارپایە؛ چارپل؛ چارپا؛ چرپا؛ تەختەدار؛ قەرەوێڵە؛ تەختی نووستن.

◘ **تختخواب تاشو**: چەرپای دەقخۆر؛ چرپایێ کە ڕووەکەی و پایەکانی لە سەر یەک کۆ دەبنەوە.

**تختخواب دونفره**: نڤینۆک؛ تەختی‌خەوی دووکەسی.

**تختخواب فنری**: تەختی فەنەری؛ چەرپای فەنەری. هەروەها: **تختخواب چوبی**

**تخت‌روان** / taxteravān، ـها/: *اسم. [قدیمی]* ١. جۆرە کەرەسەیەکی ڕاگواستنەوە بە شێوەی کەژاوە بووە بە دەستەگەلێک لە بەر و پشتەوە کە میرمەزنێک تێیدا دادەنیشت و باربەران بە سەر شانەوە یان

لە سەر دەستەوە دەیانبرد ٢. کەژاوەیەک کە بە سەر پشتی وشتر یان فیلەوە دادەنرا و مسافر تێیدا دادەنیشت.

**تخت و تاج** / taxt-o-tāc/ ☜ **تاج و تخت**

**تخت و تیار** / taxt-o-tayār/: *صفت. [گفتاری]* تەکووز؛ ساز و تەیار؛ بەرهەڤ؛ گیڤ؛ ئامادە و تەیار؛ حازر و بازر.

**تخته** / taxte، ـها/: *اسم.* تەختە: ١. دەپ؛ دەب؛ تەختەدار؛ کەردورەک؛ لەوح؛ بەرهەمێکی چێوی بە شێوەی پەڕەگەلێک بە ئەستوورایی چەن میلیمیتر تا چەن سانتیمیتر ٢. تا؛ یەکەی ژماردنی ڕاخەر، رووخەر و پەردە ٣. بەر؛ یەکەی هەژمارتنی بەری پارچە ٤. تەختەڕەش؛ تابلۆ ٥. *[گفتاری]* تەختەنەرد؛ تاوڵی؛ تاوڵە ‹بیا یک دست تخته بزنیم: وەرە دەستێک تەختە بکەین›.

◙ **تختەی شنا** ☜ **تختەشنا**

**تختەی شنو** ☜ **تختەشنا**

▣ **تخته شدن:** *[مجازی]* داخران؛ بەستران؛ گاڵە دران ‹دکانش تخته شد: دووکانەکەی داخرا›.

**تخته کردن:** *[مجازی]* گاڵەدان؛ داخستن؛ بەستن؛ مسمتاندن؛ هۆرپێکەی؛ بینتەی ‹آنجا را هم تخته کردند: ئەوێشیان گاڵەدا›.

**تخته‌ابزار** / taxte'abzār، ـها/: *اسم.* تەختەهاچەر؛ پەڕەیەکی چێوی کە ئامێری کار لە سەریەوە دادەنرێت.

**تخته‌الوار** / taxte'alvār، ـها/: *اسم.* قاتۆر؛ ئاڵۆدار؛ تەختەیەکی درێژۆکەی ڕێک و چوارگۆشە بۆ دارەڕا و ژێر کار و...

**تخته‌بند** / taxteband/: *صفت. [ادبی]* دیل؛ یەخسیر؛ دوساخ؛ تووشیار؛ گراو؛ گیرۆدە؛ دیل و باڵبەستە.

**تخته‌پاره** / taxtepāre، ـها/: *اسم.* چڵ و چێو؛ چەویڵ؛ چاوە؛ تەختەی شکاو؛ تەختەی چکۆلە ‹این تخته‌پاره‌ها را جمع کن، بریز توی اجاق: ئەم چڵ و چێوانە کۆکەوە، بیخە نێو کوورەکەوە›.

**تخته‌پاک‌کن** / taxtepāk.kon/: *اسم.* شتێ (وەک هەور) بۆ پاککردنەوەی نووسراوەی سەر تەختەی ڕەش یان سپی.

**تخته‌پوست** / taxtepûst، ـها/: *اسم.* کەڵپۆس؛ پێستەی خۆشەکراوی چوارپێیان، بەتایبەت مەڕ کە جار و بار وەک ڕایەخ دایدەخەن.

**تخته‌پهن** / taxtepehen/: *اسم.* وشکە؛ وشکەی گەوڕ؛ تۆیەک لە سەنێری وشکی چوارپێیان کە بە ناو گەوڕدا پانی دەکەنەوە.

**تخته‌رسم** / taxterasm، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* تەختەڕەسم؛ تەختەیەکی سافی چوارگۆشەیە کە لە کاتی ڕەسمکێشاندا، لە ژێر دەستی دەنێن.

**تخته‌سنگ** / taxtesang، ـها/: *اسم.* تاتەبەرد؛ تاشەبەرد؛ تەڵەبەرد؛ تەلەسەنگ؛ تەختەکوچک؛ لات؛ لات؛ یاس؛ گاشە؛ تاش؛ تەختەتەوەنی؛ بەردی گەورەی پان و لووس.

**تخته‌سه‌لایی** / taxteselāyî، ـها/: *اسم.* تەختە سێلا؛ تەختەیەک بە سێ لای ناسکەوە کە بە لای درێژی و پانیدا پێکەوە دەیانچەسپێنن. هەروەها: **تخته چندلایی**

**تخته‌سیاه** / taxtesiyāh، ـها/: *اسم.* دەپەڕەش؛ دەپڕەش؛ تەختەڕەش؛ ئەو تەختەیە کە لە فێرگەدا لە سەری دەنووسن.

**تخته‌شنا** / taxtšenā، ـها/: *اسم.* تەختەشنۆ؛ تەختەیەکی باریک و درێژ (نزیک ٥ لە ٥٠ سانتیمیتر) بە ژێرەیەکی کورتەوە کە

وەرزشکار دەستی پێوە دەگرێ و شنۆی پێدەکا: **تخته شنو**

تخته‌شنو / taxtešenow/ ☜ **تخته‌شنا**

تخته‌قاپو / taxteqāpû/: [فارسی/ ترکی] صفت. ئارانشین؛ ئاوایی‌نشین؛ هۆلس؛ تەختەقاپوو؛ تەختەقاپی؛ سەقامگیر؛ ئاری؛ ئاکنجی؛ نیشتەجێ؛ دانیشتوو لە شوێنێکی دیاریکراودا ‹آنان را در روستاها تخته‌قاپو کردند: لە گوندەکان نیشتەجێیان کردن›.

تخته‌کلاه / taxtekolāh/: اسم. [قدیمی] جۆرێک ئەشکەنجە یان سزادان بەم شێوە کە کلاوێکی چێوینی گەپ و قورسیان دەکردە سەر تاوانبارەوە و بە ناو کووچە و کۆلاناندا دەیانخولاندەوە.

تخته‌کوبی / taxtekûbî، ـها/: اسم. ١. تەیمان؛ تەیمانە؛ پەرچ؛ پێکهاتەی کاتی (زۆرتر لە بڕەگەلی تەختە) بۆ کلیدەکردنی شوێنێک یان دروستکردنی لەمپەر بە دەوری جێگەیەکدا ٢. تەختەکووبی؛ تەختەجۆش؛ تەختەبەنی؛ ڕوویەکی بەرهەڤکراو لە بڕەگەلی تەختە بۆ پۆشەنی لەپ، میچ یان دیوار.

تخته‌نرد / taxtenard، ـها/: اسم. تەختەنەرد؛ تاولە؛ تاولی؛ تەختەی نەردێن؛ کەرەسەیەک بۆ یاری دوو کەسی بە شێوەی سندووقێکی چێوی کە لە ناوەڕاستدا دەکرێتەوە و بە شێوەی دوو بەشی چوارگۆشە لە پاڵ یەکتریدا جێدەگرن و هەرکام لە یاریکەران ١٥ مۆرەی یەک ڕەنگیان هەیە و بە نۆرە تاس هەڵدەخەن و گەمە دەگەڕێنن.

تخدیر / taxdîr/: [عربی]اسم. خوماری؛ خاوی؛ سڕی؛ بەجنی؛ هەجنی؛ حالەتی گێژ و مەنگ بوونی دوای کێشانی تریاک یان خواردنەوەی ئارەق.

تخرمه / texerme/: صفت. پەتڵە؛ سایلە؛ چێشتێ کە باش لێ‌نەنرابێ (وەک برنجێک کە ببێتە هەویر یان باش نەکولابێ).

تخریب / taxrîb/: [عربی]اسم. ڕووخاوی؛ وێرانکاری؛ کار یان ڕەوتی کاول بوون یان کاول‌کردن؛ ڕمان؛ وڕەی ‹چند خانه براثر سیل تخریب شد: چەن خانوو بە هۆی لافاوەوە ڕووخان›.

◙ تخریب شخصیت: خراوکردن؛ کوتان؛ زایەکردن؛ هێرش‌کردنە سەر کەسایەتی کەسێک.

◙ تخریب کردن: ڕماندن؛ ڕووخاندن؛ خاپوورکردن؛ هەڵشاندن؛ هلساندن؛ وڕنەی؛ کاول‌کەردەی؛ تەرت و توونا کردن.

تخریبچی / taxrîbčî، ـها، ـان/: [عربی/ ترکی]اسم. [نظامی] کەسێ کە کاری لە کار خستنی مین، تەڵەی تەقینەوەیی یان کەرەسە و دامەزراوەی دوژمنە.

تخریبی / taxrîbî/:[عربی] صفت. ڕووخێنەر؛ ڕمێنەر؛ وێرانکەر؛ وێرانکار؛ خاپوورکەر ‹بمب تخریبی: بۆمی ڕووخێنەر›.

تخس / toxs/: صفت. [گفتاری] گوێ‌نەبیس؛ توخس؛ لاسار؛ بێ‌گوێ؛ کەڕەچەرگ؛ گوەهشک؛ لاپان؛ یاخی؛ سەربزێو ‹بچەی تخس: مندالی گوێ‌نەبیس›.

تخصص / taxassos/: [عربی]اسم. ١. پسپۆڕی؛ چازانی؛ شارەزایی؛ لێزانی؛ ڕێناسی؛ وەستایی؛ هۆزانی لە کاردا ‹تخصص در بیماری پوست: پسپۆڕی لە نەخۆشی پێستدا› ٢. [زیست‌شناسی] کارامەیی؛ حالەتی ئەندامێک کە بۆ ئەنجامدانی کارێکی تایبەت توانایی پەیدا کردووە: **تخصیص**

تخصصی / taxassosî/:[عربی] صفت.

پسپۆڕانە؛ شارەزایانە.

**تخصیص** / taxsîs/: [عربی]/اسم. ۱. کار یان ڕەوتی تەرخان کردن؛ بڕدان؛ تایبەتی کردن ۲. *[زیستشناسی]* ☜ **تخصص-۲**

**تخصیصی** / taxsîsî/: [عربی] صفت. تەرخانکراو؛ بڕیاردراو ‹ارز تخصیصی: پارەی تەرخانکراو›.

**تخطئه** / taxta'e, taxte'e/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی پێ بەسەردا ساوین؛ نادروست یان نارەوا ناساندنی ئەوەی کە (زۆرتر) دروست یان ڕەوایە.

**تخطی** / taxattî/: [عربی]/اسم. سەربزێوی؛ هەڵەکاری؛ لادەری؛ کار یان ڕەوتی سەرپێچی لە قانوون، نەریت یان هۆرتە و بەرەی کۆمەڵگا (بەتایبەت) بە ئەنجامدانی کارێکی هەڵە ‹بە نظر می‌رسد کە از قانون تخطی شده است: وا دیارە لە ئاستی قانووندا سربزیوی کراوە›.

**تخفیف** / taxfîf، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ۱. ڕەوتی داشکان: *الف)* لە نرخی پیتەوا لە کاتی وەرگرتنی پارە لە کڕیار ‹با ۲۰٪ تخفیف بە فروش می‌رسد: بە داشکانی ۲۰٪ەوە دەفرۆشرێ› *ب) [حقوق]* لە سزای تاوانبار ‹در مجازات مجرم تخفیف دادند: لە جزیای تاوانبارەکەیان داشکاند› *ج)* لە جەنگە یان گومڕەی شتێک؛ کەم بوونەوە؛ هاتنە خوار ‹تبش تخفیف یافته است: یاوەکەی کەم بوتەوە› ۲. هەندی داشکێنراو ‹فروشنده ۱۰٪ تخفیف داد: فرۆشیارەکە ۱۰٪ی لێ داشکاند› ۳. *[دستور]* ڕەوتی سوانی یەک یان چەند فۆنیمی وشەیەک لە زمانێکدا (وەک چۆن «نازدار» دەبێتە «نازار»).

◘ تخفیف خوردن: داشکانەوە؛ کەم بوونەوە ‹دوبارە بە او تخفیف خورد و پس از چهار سال از زندان آزاد شد: دیسان لە ماوەی بەند بوونی داشکابەوە و پاش چوار ساڵ لە بەندیخانە ڕزگاری بوو›.

تخفیف دادن: داشکاندن؛ داشکانن؛ تەقە لێدان؛ کەمکردنەوە؛ ئەرەمارەی؛ مارتەیەرە ‹فروشنده ۱۰٪ را بە ما تخفیف داد: فرۆشیارەکە ۱۰٪ی بۆ ئێمە داشکاند›.

تخفیف گرفتن: لێ‌داشکاندن؛ چنەرە مارتەی؛ کالایەک هەرزانتر لە نرخی پێشنیاری فرۆشیار لێی کڕین ‹توانست ۱۰٪ تخفیف بگیرد: توانی ۱۰٪ی لێ داشکێنی›.

تخفیف یافتن: کەم بوونەوە؛ داشکان ‹گرما تخفیف یافت: گەرما کەم بوەوە›.

**تخلخل** / taxalxol، ـها/: [عربی]/اسم. دۆخ یان چۆنیەتی کونکوناوی؛ کوناکونایی؛ هۆڵی؛ هەبوونی کونگەل یان بۆشاییگەلی جۆراوجۆر دەنێوان شتێکدا.

**تخلص** / taxallos، ـها/: [عربی]/اسم. نازناو؛ ناوێ کە شاعیر بۆ خۆی هەڵیدەبژێرێ و لە ناو شیعرەکانیدا بەو ناوە، خۆی دەناسێنێ.

**تخلف** / taxallof، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ۱. سەرپێچی؛ کار یان ڕەوتی سەربزێوی کردن و لادان؛ ڕوو وەرگێڕان؛ چەوتی کردن ‹نباید از قانون تخلف کرد: نابێ لە قانوون سەرپێچی بکرێت› ۲. لادەری؛ کار یان ڕەوتی خراپەکاری کردن ‹سبب تخلف از قانون چیست؟: هۆی لادەری لە قانون چیە؟›.

**تخلیص** / taxlîs/: [عربی]/اسم. *[نامتداول]* کار یان ڕەوتی ئازادکردن؛ ڕزگارکردن یان پاک کردنەوە لە هەر جۆرە دۆخێکی ناخۆش و نالەبار.

**تخلیط** / taxlît/: [عربی]/اسم. ئاوێتەیی؛ تێکەڵاوی؛ ئاڵشتەیی.

◘ تخلیط کردن: ۱. تێکەڵ کردن؛ شتی خراپ خستنە ناو شتێکەوە ۲. ڕاست و

درۆ پێکەوە تێکەڵ کردن ٣. نێوان دوو کەس تێکدان؛ نێوانی دوو کەس ئاڵۆز کردن.

تخلیه / taxliye /: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی: *الف)* چۆڵ کردن؛ خاڵی کردن؛ هێنانە دەرەوەی ئەو شتانەی کە لە شوێنێکدان (وەک هوودە، هەمار، بیرکم و...) ‹باید تا فردا این اتاق تخلیه شود: دەبێ تا بەیانی ئەم ژوورە چۆڵ بکرێت› *ب)* کێش؛ خاڵی کردنی بار یان دابەزاندنی مسافر لە ئامێری گواستنەوە ‹تخلیه‌ی کشتی: خاڵی کردنەوەی گەمیە› *ج)* داخەڵساندن و بەردانی خۆ لە گوشاری بە سەرداهاتوو (بە گریان، قیڕاندن، دەردەدڵ کردن و...).

▣ تخلیه اطلاعاتی: کار یان ڕەوتی لە ژێر زمان کێشانەوەی هەموو ئاگەداریگەلی پێویست لە کەسی گیراو یان کەسێ کە لێی دەپرسرێتەوە.

▣ تخلیه شدن: خاڵی بوونەوە؛ بەتاڵ بوونەوە؛ هەڵڕژان؛ چۆڵ بوون؛ هاڵی بیەی. هەروەها: **تخلیه کردن**

تخم / toxm، ـها/: اسم. ١. *[گیاەشناسی]* تۆو؛ تۆم؛ تۆو؛ تۆمە؛ تووم؛ تۆڤ؛ دان؛ دانە؛ هەرک؛ هەڤ؛ دەنک؛ توخمە ‹تخم آفتابگردان: تۆوی گوڵەبەڕۆژە› ٢. *[گفتاری]* خانۆکەی جنسی کە لە گونی گیانلەبەرانی نێردا بەرهەم دێت ٣. هێلکە؛ هیلکە؛ هاگ؛ هاگە؛ هێلە؛ هۆک؛ هاک؛ خا؛ خایە؛ نفتە؛ تیەم؛ تەنی بەرهەمهێنەر لە پەلەوەران کە زەردێنە و سپینە و توێکڵێکی هەیە ‹تخم کبوتر: هێلکەی کۆتر› ٤. هێلکە؛ هێلە؛ خا؛ خزر؛ خرز؛ خەرز؛ گەرا؛ تەنی بەرهەمهێنەر لە گیانلەبەرانی گەرادانەردا کە دەتوانێ وەکوو گیانلەبەرێکی گچکە دەربێ و سەربەخۆ بژی ‹تخم ماهی: گەرای ماسی› ٥. *[گفتاری]* خایە؛ هێلکەگون؛ هێلەگون ٦. تۆو؛ تۆم؛ تۆڤ؛ توخم؛ دان؛ دەنکێ کە بۆ بەدەسهێنانی بەرهەم دەچێندرێت ‹تخم پاشیدن: تۆو وەشاندن› ٧. *[گفتاری]* توخم؛ تۆرەمە؛ بەرە؛ نژاد؛ تۆمە؛ تۆو ‹تخم حرام: توخمی حەرام›.

▣ تخم آفتابگردان: تۆوی گوڵەبەڕۆژە؛ تۆمی گوڵەبەڕۆژە؛ تۆوی ڕۆژامپەرێز؛ ناوکە؛ تۆم ڕۆجیارپەرێز؛ دەنکی گوڵەبەڕۆژە کە خۆراکێکی چەورە و ڕۆنی لێ دەگرن.

تخم چشم: کرەی چشم ☜ **کُره**

تخم حرام: زۆڵ؛ حەرامزا؛ حەرامزادە؛ توخمە زۆڵ؛ بێچوو؛ بیژوو.

تخم لق: *[مجازی]* تۆوی ناجسن؛ تۆوی خەسارک بووگ.

تخم مرغ: هێلکە؛ هیلکە؛ هێلە؛ هێک؛ هاک؛ خای ماژ؛ مرخانە؛ هۆکی مامر؛ هێلکەی مریشک کە خۆراکێکی زۆر باوە. هەروەها: **تخم اردک؛ تخم غاز**

▣ تخم پاشیدن: تۆو چاندن؛ تۆو پژاندن؛ تۆو/ تۆم وەشاندن؛ تۆم شانەی/ پاشەی؛ همبز ئاڤیتن.

تخم دو زرده/ طلا کردن: *[تعریض]* هێلکەی دوو زەردێنە کردن؛ کارێکی بە قازانج کردن ‹چرا این‌قدر تملقش را می‌گویی مگر برایت تخم دوزرده کرده: بۆ ئەوەندە پیوازی بۆ پاک دەکەی مەگەر هێلکەی دووزەردێنەی بۆ کردووە؟›.

تخم کردن ☜ **تخم گذاشتن**

تخم کسی را کشیدن: خەساندن؛ گون کەندن؛ لە پیاوەتی خستن؛ خەسنەی؛ لە مێردگ خستن.

تخم گذاشتن: هێلکە کردن؛ هێ کرن؛ هێگ/ هێک کرن؛ خا دانیان؛ هێلە

کەردەی: **تخم کردن**

**تخم گرفتن**: توو/ تۆم گرتن؛ دەنکی گیاگەل گلێرکردنەوە.

**تخم لق در دهن کسی شکستن**: *[کنایی]* کەسێک دڵخۆش کردن؛ قەولی بێ پایە بە کەسێک دان.

**از تخم درآمدن**: سەر لە هێلکەوە دەرهێنان؛ لە هێلکە دەرهاتن؛ سەر لە هێلکە جووقاندن؛ هێلەنە جیکەی ‹جوجەها تازە از تخم درامدە بودند: جووچکەکان تازە سەریان لە هێلکە دەرهێنابوو›.

**از تخم رفتن**: لە هێلکە چوونەوە؛ ئیتر هێلکە نەکردن؛ هێلەنە شیەیوە ‹چند روز است مرغها از تخم رفتەاند: چەن رۆژێکە مریشکەکان لە هێلکە چوونەتەوە›.

**تخماق** / toxmāq، ـها/: [ترکی] *اسم*. کوتەک؛ لیس؛ تۆخماخ؛ مێکوت؛ گۆپاڵی دارین.

**تخمبر** / toxmbar/ ☜ **تخمکراه**

**تخمپوش** / toxmpûš، ـها/: *اسم*. *[گیاەشناسی]* توێکڵە؛ تووێخڵ؛ پۆشەنی دەرەکی دەنکی گیا.

**تخمدان** / toxmdān، ـها/: *اسم*. گەرادان؛ هێکدان؛ هاکدان: ۱. *[گیاەشناسی]* بەشێک لە مێینەیی گوڵ کە بریەتیە لە یەک یان چەند هێلکۆکە و بە دوای پێگەیشتن دەبێتە میوە ۲. *[جانورشناسی]* ئەندامی بەرهەمهێنەری خانۆکەی جینسی مێینە لە مۆرەداراندا.

**تخمدان ـ بیضه** / toxmdān-beyze/: [فارسی/ عربی] *اسم*. *[زیستشناسی]* خادان-گون؛ ئەندامی زاوزێی هەندێک لە گیانلەبەران (وەک شەیتانۆکە) کە کاری خادان و گون پێکەوە ئەنجام دەدات: **خاگ ـ تخمدان**

**تخمراهه** / toxmrāhe/ ☜ **تخمکراه**

**تخمریزی** / toxmrîzî، ـها/: *اسم*. خرزرێژی؛ خەرزرێژی؛ کار یان ڕەوتی گەراکردن؛ وەردانی خەرز لە گیانلەبەرانێکدا کە هێلکەی ورد و زۆر دەکەن (وەک جڕ و جانەوەرگەل و ماسیگەل) ‹فصل تخمریزی چند روز دیگر شروع میشود: هەڕەتی خەرزرێژی چەن ڕۆژی دیکە دەست پێدەکا›.

**تخمزا** / toxmzā/: *صفت*. هێلکەکەر؛ خازا؛ تایبەتمەندی گیانداری کە هێلکە دەکا و بێچووەکەی بەشێک لە قۆناغی پێگەیشتنی لە ناو هێلکەدا دەباتە سەر.

بەرانبەر: **زندەزا**

**تخمک** / toxmak، ـها/: *اسم*. ۱. *[گیاەشناسی]* بەشێک لە تۆمدانی گیاگەلی دەنکدار کە دوای پێوەند دەبنە دانە: **تخمک گیاهی** ۲. *[جانورشناسی]* هێلکۆکە؛ خانۆکەی جینسی گیانلەبەری مێینە: **تخمک جانوری**

◙ تخمک جانوری ☜ **تخمک ـ۲**

تخمک گیاهی ☜ **تخمک ـ۱**

**تخمکراه** / toxmakrāh، ـها/: *اسم*. *[زیستشناسی]* لوولەیێک کە هێلکۆکەی مێوینە پێیدا لە هێکدانەوە دێتە دەرێ: **تخمبر؛ تخمراه**

**تخمکشی** / toxmkešî، ـها/: *اسم*. کار و ڕەوتی تکەدان؛ کەڵدان؛ فاڵدان؛ ئابوورانی جووتگری گیانداران (بەتایبەت ئاژەڵان) بۆ زا و زێ کردنیان.

**تخمگانی** / toxmgānî/: *اسم*. *[زیستشناسی]* ڕەوتی بووران؛ گووران؛ زا و زێی جنسی کە تێیدا هێلکۆکەی مێوینە بە هۆی هێلکۆکەی نێرینەوە بار دەگرێ.

**تخمگذار** / toxmgozār، ـها؛ ـان/: *صفت*. هێلکەکەر؛ هیلکەکەر؛ هێلەکەر؛ خاکەر؛ خاوەن تایبەتمەندی هێلکەکردن.

**تخمگذاری** / toxmgozārî، ـها/: اسم. کار یان ڕەوتی هێلکەکردن؛ هێلەکەردەی؛ بەرهەم هێنانی هێلکە، هەر وەک زا و زێ کردنی (پەلەوەران و حەشەرەکان).

**تخم‌مرغ** / toxmemorq/ ☜ **تخم-۳**

**تخم‌مرغی** / toxmemorqî/: صفت. هێلکەیی؛ هیلکەیی؛ هێلەیی؛ هاگەیی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە هێلکە ‹مادەی تخم‌مرغی: ماکی هێلکەیی› ۲. وەک هێلکە؛ هێلکەئاسا ‹برگ تخم‌مرغی: گەڵای هێلکەیی›.

**تخم و ترکه** / toxm-o-tarake/: [فارسی/عربی] اسم. [تعریض، گفتاری] تڕ و تایفە؛ نەوە و بەرەچە؛ وەچ و بەرە؛ تخمان؛ تۆ و تۆرەمە؛ توخمان؛ توخم و تۆو.

**تخمه** / toxme، ـها/: اسم. ۱. [ادبی] بەرە؛ ڕەگەز؛ نەژاد؛ بەرەچە؛ وەچ و بەرە ‹مردی از تخمه‌ی بزرگان عمادیه: پیاوێک لە بەرەی کەلەپیاوانی ئامێدی› ۲. [گفتاری] تووو؛ تۆم؛ چنجک؛ چنچک؛ چنچە؛ جنجە؛ ناوکە؛ دەنکی خواردەمەنی بڕێک گیا و ڕووەک بە پێستێکی چێویلەی ناسکەوە کە بە سانایی بە ددان دەشکێ و کاکڵەکەی جیا دەبێتەوە و لە زۆر وڵاتان بە برژاوی وەک چەرەس بە کاری دەبەن ‹تخمه‌ی آفتابگردان: تۆوی گوڵەبەڕۆژە؛ تخمه‌ی کدو: تۆوی کوولەکە›.

▣ تخمه شکستن: تووو تڕووکاندن؛ تۆم تڕووکاندن؛ تۆم تووکان؛ تڕووکنەی؛ چنجە تەقان؛ تووو خواردن ‹در سینما تخمه می‌شکستند: لە سینەمادا تووویان دەتڕووکاند›.

**تخمی** / toxmî/: صفت. ۱. تۆمی؛ تۆم؛ پڕتۆم؛ پڕ لە تۆم ‹خیار تخمی: خەیاری تۆمی› ۲. [مستهجن] توخمی؛ گۆترە؛ بێ‌سەر و بن ‹سخنرانی تخمی: وتاری کوێرە›.

**تخمیر** / taxmîr/: [عربی] اسم. هەڵهاتوویی؛ هەڵترشاوی؛ تورش هەڵگەڕاوی؛ ڕەوتی گەڕانەوەی بە بێ‌ئاوی بڕێ شت (وەک سرکە و شەراب).

▣ تخمیر استیک: گەڕانەوەی شەراو؛ تورش هەڵگەڕان و بوونە سرکەی شەراب: **تخمیر سرکه‌ای**

تخمیر سرکه‌ای ☜ **تخمیر استیک**

**تخمین** / taxmîn/: [عربی] اسم. بەراورد؛ هەزیر؛ هەڵسەنگ؛ نەهان؛ نهانا؛ خەرس؛ خەمڵ؛ کار و ڕەوتی قەرساندنی شتێک.

▣ تخمین زدن: بەراوردکردن؛ لێکدانەوە؛ هەزیر کردن؛ خەمڵ کرن؛ نرخاندن؛ هەڵسەنگاندن؛ خەرسان؛ خەرسکردن؛ قەرساندن؛ قرساندن؛ نەهاندن ‹دارایی او را حدود صد میلیون دلار تخمین زده‌اند: داراییان دەوری سەد میلیۆن دولار بەراورد کردووە›.

**تخمینا** / taxmînan/: [عربی] قید. بە بەراورد؛ بە هەڵسەنگاندن ‹تخمینا حدود صد میلیون دلار ثروت دارد: بە بەراورد دەوری سەد میلیۆن دولار دارایی هەیە›.

**تخمینی** / taxmînî/: [عربی] صفت. بەراوردی؛ گۆترەبڕ؛ خەمڵ‌کاری.

**تخیل** / taxayyol، ـات/: [عربی] اسم. خەیاڵ: ۱. بەرهەمی بیر بە تەنیا ‹اینها که می‌گویی همه تخیل است: ئەمانە تۆ ئێژی هەمووی خەیاڵە› ۲. کار یان بڕستی بەدیهێنانی هەر چی کە لە وزەی هەستدا نیە ‹تخیل شاعرانه: خەیاڵی شاعیرانە›.

**تخیلی** / taxayyolî/: [عربی] صفت. خەیاڵی؛ بە دوور لە ڕاستەقینە ‹داستان تخیلی: چیرۆکی خەیاڵی›.

**تدابیر** / tadābîr/: [عربی] جمعِ ☜ **تدبیر**

**تداخل** / tadāxol/: [عربی] اسم. تێکەڵاوی؛

بەیەکا چوویی؛ بە یەکداچوویی ‹تداخل مسئولیتها: تێکەڵاوی بەرپرسیگەل›.

**تدارک** / tadārok، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. ئابوور؛ پێکهێنی؛ دابین ٢. [قدیمی] باربۆ؛ کار یان ڕەوتی قەرەبووکردنەوەی زیان یا هەڵە.

◘ تدارک دیدن: دابین‌کردن؛ فەراهەم کردن؛ ئامادەکردن؛ ئابوورین؛ پێک هێنان: ١. ڕێکخستن؛ ڕێکوسەی؛ شتێ، بەتایبەت پێشەکی و پێداویستیگەلی کارێک ڕێکخستن ‹در فکر تدارک عروسی بود: لە بیری ڕێکخستنی زەماوەندا بوو› ٢. شتی پێشوازی (بەتایبەت خورد و خۆراک) بۆ میوان دابین کردن ‹تدارک زیادی دیده بودند: شتی زۆریان دابین‌کردبوو›

تدارک کردن: ١. ئابوورین؛ دابین‌کردن ٢. [قدیمی] قەرەبووکردنەوە.

**تدارکات** / tadārokāt/: [عربی]/اسم. ئابوورەمەنی: ١. پێداویستی و کەرەسەی پێویست بۆ ئەنجامدانی کارێک یان بەڕێوە بردنی کۆڕێک ٢. [قدیمی] لۆجێستیک ‹ادارەی تدارکات ارتش: مەزرینگەی ئابوورەمەنی ئەرتەش›.

**تدارکاتی** / tadārokātî/: [عربی] صفت. ئابوورەمەندی؛ ئابوورەمەنی.

**تداعی** / tadā'î، ـها/: [عربی]/اسم. [روان‌شناسی] بەرهەنگاری؛ کار یان ڕەوتی هاتنەوە بەرچاو؛ شباندن؛ وەبیر هاتنەوەی شتێک بە بۆنەی ویکچوون، لێکنزیکی، یان دژایەتیەک کە لەگەڵ شتێکی دیکەدا هەیەتی.

◘ تداعی معانی: بەرهەنگاری واتایی؛ بیر بۆ هاتن یان سەرهەڵدانەوەی واتایەک لە مێشکدا بە هۆی دیتنی شتێک یان وەبیر هێنانەوەی واتایەکی دیکە کە ئەو دووە لە بارێکەوە لێک نزیکن.

**تدافع** / tadāfo'، ـات/: [عربی]/اسم. بەرگری؛ پێشگری؛ بەرەڤانی؛ باڵەپسکێ.

**تدافعی** / tadāfo'î/: [عربی] صفت. بەرگرانە؛ پێشگرانە.

**تداول** / tadāvol/: [عربی]/اسم. باو؛ ڕمێن؛ ڕەونەق؛ ئەوەی (لە وتە یان کردەوە) کە لە نێوان خەڵکیدا ڕەواجی هەیە.

**تداوم** / tadāvom/: [عربی]/اسم. بەردەوامی؛ درێژەداری ‹در کارش تداوم ندارد: لە کاریدا بەردەوامی نیە›.

**تداوی** / tadāvî/: [عربی]/اسم. [نامتداول] دەرمانکاری؛ کار یان ڕەوتی دەرمان‌کردن؛ تیمارکردن ‹اصول تداوی: بنەماگەلی دەرمانکاری›.

**تدبیر** / tadbîr، ـها؛ تدابیر/: [عربی]/اسم. [ادبی] چارەسەری؛ ڕاوێژ؛ مشوور؛ چارەسەردۆزی: ١. کار یان ڕەوتی چارە دۆزینەوە؛ چارە؛ چار؛ ڕێگە ‹تدبیری بیندیشید: چارەیێک بدۆزنەوە› ٢. بەڕێوەبەری؛ کارگێڕی ‹تدبیر کشور: بەڕێوەبەری وڵات›

◘ تدبیر منزل: [قدیمی] ماڵداری؛ دنیاداری؛ خانووداری؛ بنەوانی.

**تدبیرآمیز** / tadbîrāmîz/: [عربی/ فارسی] صفت. چارەمەندانە؛ چارەسەرانە؛ بەمشووری ‹سیاستهای تدبیرآمیز: سیاسەتگەلی چارەمەندانە›.

**تدخین** / tadxîn/: [عربی]/اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی دووکەڵ کردن/ کەردەی؛ دووکەڵ هەڵکێشان؛ دووکردن؛ جگەرە، قلیان و... کێشان.

**تدریج** / tadrîc/: [عربی]/اسم. دۆخ یان چۆنیەتی پلە-پلە بوون.

**تدریجا** / tadrîcan/: [عربی] قید.

ورده‌ـورده؛ ئـارام‌ـئـارام؛ چکـه‌ـچکـه؛ بـه‌ره‌ـبـه‌ره؛ کـه‌م‌ـکـه‌م؛ واره‌ـواره؛ نه‌خته‌ـنه‌خته؛ شوێ‌ـشوێ؛ به‌سێوه‌ت؛ به‌ وه‌رکـان؛ هـه‌ر وه‌رێنـه؛ هێـدی‌ـهێـدی؛ شێنه‌ی؛ به‌ شێنه‌یی ‹تدریجاً حالم خوب شد: [illegible] حالم باش بۆوه›.

**تدریجی** / tadrîcî/: [عربی] *صفت.* پله‌ـپله؛ ورد‌ـورد؛ ورده‌ـورده؛ به‌ره‌ـبه‌ره؛ که‌م‌ـکه‌م؛ واره‌ـواره؛ هـه‌رووه‌رێنـه؛ کـه‌م‌ـکـه‌م و خوه‌ش‌ـخوه‌ش؛ شێنه‌شێنه‌ی؛ خاوه‌ن دۆخ یان چۆنیه‌تی هێـواش یـان قۆنـاغ‌ـقۆنـاغ ‹تحـول تدریجی: گۆڕانی [illegible]›.

**تدریس** / tadrîs/: [عربی] /*اسم.* وانه‌بێژی؛ کار یان ڕه‌وتی ده‌رس وتن؛ وانه وتن؛ ده‌رس دان ‹در آنجا زبانهای خارجی هم تدریس می‌شد؛ او در روستا تدریس می‌کرد: له‌وێدا زمانگه‌لی بیانیش [illegible]؛ له لادێدا [illegible]›.

▣ تدریس خصوصی: وانه‌بێژی تایبه‌تی.

**تدفین** / tadfîn/: [عربی] /*اسم.* به خاکسپێری؛ مردوونێژی؛ کار و ڕه‌وتی مردوو ناشتن؛ مردوو ناژتن؛ مردوو نیان؛ ئه‌سپه‌رده‌کردن؛ مه‌رده نیه‌ی؛ مه‌رده سره‌ونه‌ی؛ به خاک سپاردنی گیان سپاردوو ‹در مراسم تدفین حضور نداشتم: له به [illegible]دا نه‌بووم›.

**تدقیق** / tadqîq/: [عربی] /*اسم.* [*ادبی*] وردبینی؛ کار یان ڕه‌وتی هشاندن.

▣ تدقیق کردن: لێ وردبوونه‌وه؛ سه‌رنج دان؛ تێڕامان.

**تدلیس** / tadlîs/: [عربی] /*اسم.* [*حقوق*] فریوکاری؛ هه‌نگبازی؛ گزیکاری؛ کار و ڕه‌وتی درۆ و ده‌له‌سه چاخ‌کردن؛ فێڵ و ته‌ڵه‌که نانه‌وه؛ خه‌ڵه‌تاندن (وه‌ک ئه‌وه‌ی کالایه‌کی خراو له باتی کالایه‌کی باش بفرۆشن).

**تدوین** / tadvîn/: [عربی] /*اسم.* ۱. تۆمارکاری؛ کار یان ڕه‌وتی کۆکردنه‌وه‌ی نووسراوه ۲. کار یان ڕه‌وتی هه‌ڵوه‌ژارتن؛ ته‌کووزکردن؛ هه‌ڵپه‌رتاوتنی فیلم (وێنه‌گه‌لی هه‌ڵگیراو) به پێی فیلمنامه‌وه.

**تدوینگر** / tadvîngar، ـان/: [عربی] /*اسم.* که‌سێ که کاری تۆمارکردنی فیلمه.

**تدهین** / tadhîn/: [عربی] /*اسم.* [*ادبی*] ڕۆن‌ماڵی؛ ڕه‌وغه‌ن‌ماڵی؛ کاری چه‌ورکردن، به‌تایبه‌ت پێداساوینی ڕۆنی بۆنخۆش.

▣ تدهین کردن: ڕۆن په‌رخان؛ ڕۆن په‌رخدان؛ ڕۆن ماڵین؛ ڕه‌ون پۆڕه‌ره ئارده‌ی؛ ڕۆن (زیاتر بۆنخۆش) به شتێکدا ماڵین.

**تدین** / tadayyon/: [عربی] /*اسم.* دینداری؛ به‌دینی.

**تذبذب** / tazabzob/: [عربی] /*اسم.* [*نامتداول*] وازوازیه‌تی؛ دوودڵی؛ دوه‌دڵی؛ ڕاڕایی؛ عه‌نته‌رمه‌زاجی.

**تذرو** / tazarv، ـها؛ ـان/: /*اسم.* [*ادبی*] چوریۆڕ؛ قه‌رقاوڵ؛ مه‌ره‌کێفی؛ مریشکی کووڤی؛ که‌ڵه‌شێری دارستان؛ باڵدارێکی دووچکه درێژه له که‌و گه‌وره‌تره و له لێڕه‌واردا ده‌ژی.

**تذکار** / tezkār، ـها؛ ـات/: [عربی] /*اسم.* [*ادبی*] بیرهێنی؛ بیرئانی؛ ڕه‌وتی بیرهێنانه‌وه؛ خستنه‌وه بیر.

**تذکاریه** / tezkārîyye، ـها/: [عربی] /*اسم.* بیره‌وه‌ری؛ ویره‌وه‌ری؛ یادداشت؛ نووسراوه‌یه‌ک (زۆرتر) که له ده‌وڵه‌تێکه‌وه بۆ ده‌وڵه‌تێکی تر ده‌نێردرێ.

**تذکر** / tazakkor، ـها؛ ـات/: [عربی] /*اسم.* کار یان ڕه‌وتی به گوێدادان؛ پێگوتن؛ پێوتن؛ پنه‌واته‌ی؛ وه‌بیرهێنان؛ وه‌بیرهێنانه‌وه بۆ

ڕاستکردنەوەی هەڵە یان بەرگری لە تووشی هەڵە بوون ‹به او تذکر دادم که نباید وارد شود: دام به گوییدا که نابێ بێتە ژوورەوە›.

**تذکره** / tazkere، ـها/: [عربی]/اسم. ١. ژین‌نامە؛ یادنامە؛ چەشنێک فەرهەنگی ژین‌نامەییە لەبارەی ژینی گرۆیێک یا ڕیزێکی پیشەیی یان کۆمەڵایەتییەوە ‹تذکرەی شعرا: ژین‌نامەی شاعیران› ٢. [قدیمی] پەساپۆرت؛ پاسپۆرت.

**تذهیب** / tazhîb، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. زێڕکاری؛ تەلاکاری؛ کاریان ڕەوتی ڕازاندنەوە (کتێب یان کاغەز) ٢. تەزهیب؛ جوانکاری لە سەر پەراوێزی نووسراوە.

**تر**[1] / tar/: صفت. تەڕ: ١. هیتە؛ شەدار؛ شێدار؛ شۆدار؛ شل؛ بەئاو ‹لباس تر: بەرگی تەڕ› ٢. تەرچک؛ سەرسەوز؛ تەڕ و تازە؛ پاراو؛ تێراو ‹گیاه تر: گیای تەڕ›.

▣ **تر و خشک با هم سوختن**: [کنایی] چاک و خراپ پێوە بوون؛ تەڕ و وشک پێوەرە سۆتەی ‹اگر جنگی بشود تر و خشک با هم می‌سوزد: ئەگەر شەڕێ بێت چاک و خراپی پێوە دەبێت›.

**تر و خشک کردن**: تاقەتکردن؛ لێپرسینەوە و پەرستاریکردن ‹زنم رفته مسافرت و من باید بچه را تر و خشک کنم: ژنەکەم چووەتە سەفەر و من دەبێ منداڵەکە تاقەت بکەم›.

**ـتر**[2]: پسوند. ـ تر؛ ـ تەر؛ نیشانەی ئاوەڵناوی هەڤیازی (صفت تفضیلی) ‹بلندتر: بەرزتر›.

**تر** / ter/: صوت. [مستهجن] فیڕ؛ تەقەتڕ؛ شیڕە؛ فیرە؛ تووڕە؛ دەنگی ڕیانی تراوی.

▣ **تر زدن**: [تعریض] ڕیان: ١. گووکردن؛ ڕینەی ٢. [مجازی] گوو تێکردن؛ گوو کردنە نێو کارێک؛ خراپکردن ‹خیاط تر زد بە پارچەی بە این گرانی: خەیاتەکە پارچەی بەم گرانییەی گووتێکرد›.

**ترابری** / tarābarî، ـها/: اسم. ڕاگوێزی؛ ئاڵوگۆڕ؛ ئازوگۆز؛ کار یان ڕەوتی بردنی بار یان مسافر لە جێگەیەکەوە بۆ جێگایەکیتر بەتایبەت لە مەودایەکی زۆردا.

**تراپوتیک** / t(e)rāputik/: [؟]/اسم. دەرمان‌ناسی؛ هەتوان‌ناسی.

**تراجم** / tarācom/: [عربی] جمعِ ☜ **ترجمه**

**تراخم** / terāxom, tarāxom/: [فرانسوی از یونانی]/اسم. ئاڵەک؛ تەراخۆم؛ تەراخوما؛ تەرەخوم؛ نەخۆشیەکی چاوە کە دەبێتە هۆی ترسان لە ڕووناکی، ئێش و فرمێسکڕێژی و بڕێ جاریش کوێری بە دواوە دێ.

**تراخمی** / terāxomî, tarāxomî، ـها/: [فرانسوی] صفت. ئاڵەکەیی؛ گیرۆدەی ئاڵەکە ‹بیمار تراخمی: نەخۆشی ئاڵەکەیی›.

**تراز**[1] / tarāz/: اسم. ١. /ـها/ تراز؛ تەراز؛ دەقە؛ ڕاستەی بەنا؛ ئامرازێکی بەنایی ٢. /ـها/ [حسابداری] ڕێکار؛ هاوسەنگی نێوان ڕیزی قەرزداری و قەرزدەری و هەروەها جیاوازی ئەو دوانە لە دەفتەرێکیماڵیدا ٣. پلە؛ پایە ‹دانشمندان تراز اول: زانایانی پلە یەکەم›.

**تراز**[2]: صفت. ڕێک؛ تراز: ١. تەخت ‹کف اتاق تراز نیست: کەفی دیوەکە ڕێک نیە› ٢. ڕێکبەڕێک ‹این میز را با آن یکی تراز کن: ئەم مێزە لە گەڵ ئەوەکە ڕێکبەڕێک کە›.

**ترازش** / tarāzeš/: اسم. ڕێککاری: ١. کار یان ڕەوتی ڕێک و تەرازکردن ٢. کار یان ڕەوتی ڕێککردنی شتێ بە پێی سەرچاوەیەک.

**ترازنامه** / tarāznāme، ـها/: اسم. هاوسەنگنامە؛ ڕیزێک کە ڕادەی داهات، خەرج، قەرزداری و بە قەرزدانی

دامەزراوەیەک لە خولێکی دیاریکراودا پیشان دەدات.

**ترازو** / tarāzû/:اسم. تەرازوو: ١. /ـھا/ شەهێن؛ شەهێن؛ ترازی؛ ترازیێ؛ ترازوو؛ ئامرازی کێشان و سەنگ کردن ٢. *[نجوم]* میزان؛ ئەستێرەیێک لە ئاسمانی نیوەی باشووری زەویدا: **میزان**

▣ ترازوی آلمانی ☜ **ترازوی خودکار**

ترازوی خودکار: تەرازوویێک کە تەنیا سەنگنەیەکی هەیە و نیازی بە سەنگ و کێشە نیە و بە هۆی ئاوەنگێکەوە کێشانە دەکێشێ: **ترازوی آلمانی**

ترازوی ریروال: تەرازووی دووبەری؛ تەرازوویەک کە دوو کەفەی هەیە و لە یەکیان سەنگ و لەوی دیکە کێشانە دادەنێن.

ترازوی زنجیری: تەرازووی زەنجیری؛ تەرازوویەک کە بە هۆی ڕاگوێزانی زنجیرێک کە بە یەکێک لە باسکەکانیەوە ئاوێزان کراوە، شتی پێ دەکێشن.

▣ در ترازو گذاشتن: *[مجازی]* هەڵسەنگاندن؛ تاقی کردنەوە ‹سود و زیان کار را در ترازو گذاشتم دیدم بد نیست: قازانج و زەرەری کارەکەم هەڵسەنگاند، دیتم خراپ نیە›.

**ترازودار** / tarāzûdār، ـھا؛ ـان/:اسم. سەنگدار؛ کەسێ کە لە فرۆشگەدا کێشانەی شتومەکی بە ئەستۆیە.

**ترازوداری** / tarāzûdārî/:اسم. سەنگداری؛ پیشەی سەنگدار.

**ترآژدی** / terājedî، ـھا/: [فرانسوی]/اسم. تراژێدیا: ١. خەمنامە؛ سۆزنامە؛ جۆرە شانۆ یا فیلمنامەیەک کە تێیدا دژبەری و چالاکیگەلی ناوەکی و دەرەکی قارەمانەکەی (یا قارەمانەکانی) بە چەشنی ناچارەسەر، دەبێتە هۆی پێک هاتنی ئاکامێکی دڵتەزێن و ناخۆش ‹تراژدی هاملت: تراژیدیای هەملیت› ٢. کارەسات؛ ڕووداوی ئێجگار دڵتەزێن.

**تراس** / t(e)rās، ـھا/: [فرانسوی]/اسم. ١. بەرسڤک؛ بەرهەیوان؛ بەرهێوان؛ بەرهەیوانی؛ هەیوانە؛ هەیوانۆکە؛ بانێژە؛ بەربێلایی؛ بێلایی؛ بەبێلاتی؛ بانجێڵە؛ بەربانێژە؛ بانیجەڵە؛ ئەنوا؛ بێرایی ٢. *[زمین‌شناسی]* زەوینێک تەخت و تا ئەندازەیێک هامار لە کەناری ڕووبار یا قەراخی دۆڵێکدا

**تراست** / t(e)rāst، ـھا/: [انگلیسی]/اسم. تراست؛ یەکیەتیەک لە چەند بنکەی پیشەسازی یان ئابووری بۆ کەم کردنەوەی ڕادەی ڕقەبەرایەتی و نرخ دانانی بە دڵخواز.

**تراش**[1] / tarāš/:اسم. ١. تراش؛ کار یان ڕەوتی تاشین ‹تراش دادن: تراش دان› ٢. تراش؛ کەم بوونەوە لە ئەستوورایی شتێک بە هۆی داتاشیانەوە ‹تراش خوردن: تراش خواردن› ٣. تراش؛ کار یان ڕەوتی داتاشان؛ داتاشین؛ ئەرەتاشەی؛ تاشەیرە؛ ساف و لووس کردن یان بێ گنج و تەخت دەرهاوردن (وەک ڕووی بەردگەلی بایەخدار) ‹تراش انگشتر تعریفی نداشت: تراشی ئەنگوستیلەکە وەهاش نەبوو› ٤. /ـھا/ تراش‌خواردوو؛ تاشراو؛ تاشیاگ؛ تاشیاو ٥. *[گفتاری]* میدادتەراش؛ قەڵەمتراش؛ قۆتراش.

▣ تراش خوردن: تراش خواردن؛ تاشران؛ داتاشران.

تراش دادن: تاشین؛ داتاشین؛ تاشەی.

ـ **تراش**[2]: *پیوازه.* ـ تاش؛ ـ تراش؛ ـ داتاش؛

ـ هەڵتاش؛ داتاشەر ‹چوب‌تراش: چێوتاش›.
**تراشکار** / tarāškār، ـها؛ ـان/:اسم. تراشکار؛ کەسێ کە پیشەی تراشکاریە.
**تراشکاری** / tarāškārî/:اسم. تراشکاری: ١. کار یان ڕەوتی تاشینی کانزا بە مەکینەی تراش ٢. ـها/ کارگەی تایبەت بە تراشکاری ٣. پیشەی تراشکار.
**تراشه** / tarāše، ـها/:اسم. تویلاش؛ تلاش؛ تۆلاش؛ تۆلاشە؛ تلیش؛ تیشیا؛ تەڕاش؛ تۆخل؛ تویخل؛ باریکەییک لە شتێ کە بە هۆی تاشین یان شکیان، لێ جوێ دەبێتەوە: **تریشه**
ـ **تراشی** / tarāšî/: پیواژه. ١. ـ تاشی؛ ـ تراشی؛ کاری تاشین ‹سنگ‌تراشی؛ پیکرتراشی: کوچک تاشی؛ پەیکەرتاشی› ٢. [مجازی] کار یان ڕەوتی هەڵبەستن ‹دروغ‌تراشی: درۆهەڵبەستن›.
**تراشیدن** / tarāšîdan/: مصدر. متعدی. //**تراشیدی**: تاشیت؛ **می‌تراشی**: دەتاشی؛ **بتراش**: بتاشە// تاشین؛ تراشین؛ تەراشین؛ ڕەوتین؛ داتاشین؛ تاشتەی؛ تاشای: ١. کردان؛ کڕەدەی؛ قوسان؛ هەڵکراندنی شتێک بە هۆی پێداهێنانی ئامێرێکی تیژەوە بە ڕوویەکدا کە پێیدا چەسپاوە ‹تراشیدن سر: تاشینی سەر› ٢. گۆڕاندنی بیچم یان ئەستوورایی شتێک بە کێشان یا کوتانی ئامێرێکی تیژ بە ڕووی دەرەوەی ئەو شتەدا ‹تراشیدن سنگ؛ تراشیدن چوب: داتاشینی بەرد؛ تاشینی چێو› ٣. [مجازی] پێکهێنان یان خۆش کردنی شتێکی درۆینە ‹دشمن تراشیدن؛ مشکل تراشیدن: دوژمن تاشین؛ گێچەڵ خوش کردن› ٤. [مجازی] هێنانەوە؛ دەرهێنان؛ لە خۆ وەدەرهێنان؛ بەرئاردەی؛ ئاردەیوە؛ دروست کردن یان ڕێکوپێک کردنی شتێکی ناڕاست ‹بهانه تراشیدن: بیانوو هێنانەوە›. هەروەها: **تراشیدنی**
■ صفت فاعلی: **تراشنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **تراشیده** (تاشراو)/ مصدر منفی: **نتراشیدن** (نەتاشین)
**تراضی** / tarāzî/: [عربی]/اسم. ڕەزامەندی؛ کار یان ڕەوتی خۆش بوون؛ خوەش بوون؛ وەش بیەی؛ ڕەزامەند بوون.
▣ تراضی‌طرفین: ڕەزامەندی هەر دوولا.
**ترافیک** / t(e)rāfîk/: [فرانسوی از انگلیسی] /اسم. ترافیک: ١. هاتوچۆ؛ هاتوچوو؛ ئاموشۆ؛ ئامەولوەی؛ گەڕ و خولی ئامێرگەلی گواستنەوە ٢. قەرەباڵغی؛ شلۆقی؛ جەنجاڵی؛ چڕ و پڕی لە هاتوچوودا ‹دیشب توی ترافیک گیر کرده بودیم: دوێشەو لە نێو ترافیکدا گیرمان کردبوو›.
**تراکتور** / t(e)rāktor، ـها/: [فرانسوی]/اسم. تەراکتۆر؛ تراکتۆر؛ کەرەستەیەکی موتۆری بە دوو تەگەرەی گەورە و ئاژدارەوە کە بۆ ڕاکێشانی مەکینەگەلی کشتوکاڵ (وەک گاواسن، تووپاش، خەرمانکوت) کەڵکی لێوەردەگرن.
**تراکتورچی** / t(e)rāktorčî، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ ترکی]/اسم. تەراکتۆردار؛ ئاژۆتکاری تەراکتۆر.
**تراکتورسازی** / t(e)rāktorsāzî/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. تەراکتۆرسازی: ١. ـها/ کارخانەی دروست کردن یان کارگەی دروست کردنەوەی تەراکتۆر ٢. کار یان ڕەوتی دروست کردنی تەراکتۆر.
**تراکم** / tarākom، ـها/: [عربی]/اسم. پڕایی؛ چڕی؛ پری؛ پۆڕی؛ شلخە؛ شخڵ؛ کەڵەکە؛ کۆما؛ کۆم؛ دۆخ یان چۆنیەتی کۆ بوونەوە لە پەنایەک یان بە سەر یەکدا ‹تراکم جمعیت: پڕایی گەل›.

تراکمه / tarākeme/: [؟] جمعِ ☜ تُرکَمَن

تراک‌میکسر / t(e)rākmîkser، ـها/: [انگلیسی]/اسم. تراکمیکسێر؛ ماشینێک بۆ بردن و هەڵشێواندنی بتۆن، بە شێوەی بۆشکەیەکی گەورە کە لە سەر کامیۆنێک دانـدراوە و هەروا کە دەڕوا سوور دەخواتەوە.

تراموا / t(e)rāmvā، ـها/: [از فرانسوی/ از انگلیسی]/اسم. تراموا؛ قەتاری خیابانی: تراموای

ترامواى / t(e)rāmvāy/ ☜ تراموا

ترانزیت / t(e)rānzît/: [فرانسوی از ایتالیایی] /اسم. ترانزیت؛ کار یان ڕەوتی پەڕینەوە؛ تێپەڕین؛ ڕۆیشتنی شمەک، ڕێبوار یا ئامێرگەلی گواستنەوە لە وڵاتێکەوە بۆ وڵاتێکی تر.

ترانزیتی / t(e)rānzîtî/: [فرانسوی] صفت. تێپەڕینی؛ ترانزیتی؛ سەبارەت بە ترانزیت ‹جادەی ترانزیتی: ڕێگەی ترانزیتی›.

ترانس / t(e)rāns/: [فرانسوی] ☜ ترانسفورماتور

ترانسپارنت / t(e)rānspārent/: [انگلیسی] /اسم. کاڵک؛ کاغەز مۆمی؛ کاغەزێکی نیوە ماتە، بۆ ڕەسم‌کێشان و نەخشە دانان بەکار دێ.

ترانسپورت / t(e)rānsport/: [فرانسوی]/اسم. ڕاگوێزی؛ ئاڵوگۆڕ؛ ئازوگۆز: ترابری

ترانسفورماتور / t(e)rānsformātor، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ترانس؛ ئامێرێکی کارەباییە بۆ زۆرترکردن یان کەم‌کردنەوەی هێزی کارەبا لە ماشێن یان کەرەستەیێکدا.

ترانویسی / tarānevîsî، ـها/: [؟]/اسم. تەرانووسی؛ کار یان ڕەوتی نووسینی وشەگەلی زمانێک بە پیتگەل و ڕێنووسی زمانێکی تر (وەک بوسیدن: بووسیدەن، boosidan).

ترانه / tarāne، ـها/: اسم. ١. ستران؛ سران؛ گۆرانی؛ گۆرانیێ؛ قام؛ لاوک؛ لاوژە؛ لاوێژ؛ چڕە؛ هەڵبەستە؛ هۆنراوە؛ بەستەک؛ بەستەی گۆرانی؛ نستران؛ ئەستران ٢. [قدیمی] هەوا؛ ئاهەنگ؛ ئاواز؛ لاوە ٣. [ادبی] چوارینەکانی زاری گۆرانی؛ فەهلەویان.

ترانه‌خوان / tarānexān، ـها؛ ـان/: اسم. گۆرانی‌بێژ؛ ستران‌بێژ؛ سترانڤان؛ مەقام‌بێژ؛ قامبێژ؛ بەستەبێژ؛ دەنگبێژ؛ لاوک‌بێژ؛ بێژەن؛ بوێژ؛ گۆرانی‌چڕ؛ چاووش؛ شایەر؛ گۆرانی‌واچ؛ چڕە ـ چڕە؛ کەسێ کە گۆرانی دەخوێنێ.

ترانه‌ساز / tarānesāz، ـها؛ ـان/: اسم. ستران‌چێ؛ ستران‌ساز؛ گۆرانی‌ساز؛ کەسێکە ستران (بەتایبەت ئاهەنگەکەی) دروست دەکات.

ترانه‌سرا / tarānesarā، ـها؛ ـیان/: اسم. هۆنراوەهۆن؛ هەڵبەستەوان؛ کەسێ کە ستران (بەتایبەت شیعرەکەی) دروست دەکا.

تراوا / tarāvā/: صفت. ئاودەڵێن؛ دەڵێن؛ دەڵینە؛ بە تایبەتمەندی ئاودەڵێنیەوە.

تراوائی / tarāvā'î/ ☜ تراوایی

تراواندن / tarāvāndan/: مصدر. متعدی. [ادبی] //تراواندی: دەلاندت؛ میتراوانی: دەدەڵێنی؛ بتراوان: بدەڵێنە// دەلاندن؛ دەلانن؛ دیلاندن؛ تەڕایی پێدادان.

تراوایی / tarāvāyî/: اسم. دەڵێنی؛ ئاودەڵێنی: ١. کار یا ڕەوتی ڕۆیشتنی کەمەکەمەی ئاو یا گاز لە شتێکەوە ٢. تایبەتمەندی بڕێ شتان کە دەبێتە هۆی ئاو لێ ڕۆیشتنیان * تراوائی

تراورتن / t(e)rāvertan، ـها/: [فرانسوی] اسم. تراوێرتەن؛ جۆرێ بەرد بۆ جوانکاری

مالْ بەکار دەچێ.

**تراورس** / t(e)rāvers، ـھا/: [فرانسوی]/اسم. تراویرس؛ هەرکام لەو تەختە لاکێشانە کە لە پانایی هێڵی ئاسن و لە ژێر ڕەیلەوە دایدەنێن.

**تراوش** / tarāvoš/: اسم. ۱. کار یان ڕەوتی دەلان؛ دەڵیان؛ دیلان؛ نمدان ‹تراوش آب: دەڵینی ئاو› ۲. ـها؛ ـات/[زیست‌شناسی] نم‌تک؛ کار یان ڕەوتی لێبوونەوە یان بڵاو بوونەوەی ماکێک (زۆرتر تراو) لە لکێکی لەشی گیاندارەوە ‹تراوش بزاق: نم‌تکی ئاوی دەم›.

▣ **تراوش احساسات**: هەست هرووژان؛ هەست بزوان؛ هرووژانی هەست؛ بەر بوونی هەست و نەست.

▣ **تراوش کردن**: دەڵین؛ دلۆڤین؛ دەڵیان؛ دەلان؛ دەڵەدان؛ تەڕاییدان تەڕاوشت کردن.

**تراول‌چک** / t(e)rāvelček/: [از انگلیسی] ☜ چک مسافرتی، **چک**

**تراولرچک** / t(e)rāvelerček/: [از انگلیسی] ☜ چک مسافرتی، **چک**

**تراویح** / tarāvîh/: [عربی] ☜ نماز تراویح، **نماز**

**تراویدن** / tarāvîdan/: مصدر. لازم. [ادبی] //**تراویدی**: ـــ ؛ **می‌تراوی**: ـــ ؛ **بتراو**: ـــ// ۱. دەلان؛ دەڵین؛ دیلان؛ تەڕایی دادان؛ پرزانەوە؛ هاتنە دەری تنۆکە وردیلەی تەڕایی لە دەورو بەری دەفردا ۲. [مجازی] دەرهاتن؛ دانەوە؛ بڵاوەکردن ‹نور چراغ از پشت پرده می‌تراوید: شەوقی چراکە لە پشت پەردەکەوە دەردەهات›. هەروەها: **تراویدنی**

■ صفت فاعلی: **تراونده** (ـــ)/ صفت مفعولی: **تراویده** (دەلاو)/ مصدر منفی: **نتراویدن** (نەدەلان)

**ترب** / torob، ـها/: اسم. توور؛ تووری؛ ترپ؛ تفر؛ ترەوی؛ ترب؛ تویر؛ تێرپ؛ ترپە؛ گۆڕ؛ بنەگیاییکی یەک‌ساڵەیە، ڕیشەکەی ئەستوور دەبێ و دەخورێ.

▣ **ترب سیاه**: تووره ڕەشە؛ تووره فەرەنگی؛ ترپەڕەشە؛ ترەوە سیاوێ؛ جۆرێ تووری پێست‌ڕەشە و خواردنی بۆ دەرمان باشە.

**تربانتین** / t(e)rebāntîn/: [فرانسوی]/اسم. شۆک؛ شۆکە؛ شۆبە؛ هەڵمی ساردەوەکراوی شیرەی دارە بەن، کە تراوێکی بۆن خۆشە و بۆ زۆر دەرمانی خواردن و پێست بەکار دێ: **جوهر سقز**

**تربت** / torbat، ـها/: [عربی]/اسم. خاک؛ ئاخ: ۱. شەخس؛ گڵکۆی پیرۆز ۲. خاکی مبارەک؛ ئاخاپیرۆز ۳. [ادبی] بارەگا؛ بارگا؛ خزن؛ قسن؛ گۆڕ؛ گڵکۆ؛ دواهەوار ‹تربت خواجه حافظ: تربەی خواجه حافز›.

**تربچه** / torobče، ـها/: اسم. تووره سوورە؛ شیمێ؛ فجیل؛ توورچە؛ ترپچە؛ جۆرێک تووری بچکۆلەی پێست سوورە.

**تربد** / torbod، ـها/: اسم. شەلەمە؛ شەرواڵ بە کۆڵ؛ ئاڵەکۆکە ڕێخنە؛ گیایەکی چەن ساڵەیە کە بنەکەی زگ ڕێخەرێکی زۆر بە قەوەتە.

**تربری** / tarborî، ـها/: اسم. تەربڕی؛ سەوزبڕی؛ کار یا ڕەوتی بڕینی دار و گیای سەوز (وەک دار و چلاک). هەروەها: **تربُر**

**تربیت** / tarbiyat، ـها/: [عربی]/اسم. پەروەرشت؛ پەروەردە؛ کار یان ڕەوتی پێ گەیاندن؛ ڕاهێنان: ۱. بەخێو ‹تربیت زنبور عسل: پەروەرشتی هەنگ› ۲. ئاکاری شیاو و گونجاو لەگەڵ نەریتی کۆمەڵگا یان جێگە و شوێنی ژیان و کار ‹تربیت اجتماعی: پەروەرشتی کۆمەڵایەتی› ۳. کار یا ڕەوتی ڕاهێنان و بارهێنان بۆ پیشەی ڕەچاوکراو

‹تربیت معلم: ڕاهێنانی مامۆستا›.

▣ تربیت بدنی: وەرزش؛ بارهێنانی لەش.

تربیت معلم: ڕاهێنانی مامۆستا؛ ڕاهێنانی فێرکار؛ لقێک لە خوێندن کە کاری لێکدانەوەی شێوازگەلی دروستی وانە گوتنەوەیە.

▣ تربیت شدن: بارهاتن؛ ڕەنێو هاتن؛ پەروەردە بوون. هەروەها: **تربیت کردن**

**تربیت‌بدنی** / tarbiyatbadanî/: [عربی] ☜ **تربیت**

**تربیت‌شده** / tarbiyatšode، ـها؛ ـ گان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بارهاتوو؛ پەروەردەکراو؛ ڕاهاتوو؛ پێگەیێنراو؛ ڕەنێوهاتوو؛ دەرهاتوو؛ فێرکراو.

**تربیت‌معلم** / tarbiyat(e)mo'allem/: [عربی] ☜ **تربیت**

**تربیتی** / tarbiyatî/: [عربی] *صفت.* پەروەرشتی؛ بارهێنانی؛ ڕاهێنانی؛ پەروەردەیی ‹اصول تربیتی: بنەماگەلی پەروەرشتی›.

**تربیع** / tarbî'، ـات/: [عربی]/*اسم.* ١. کار و ڕەوتی چواربەش‌کردنەوە ٢. */نجوم/* چۆنیەتی جێگر بوونی مانگ لە دوو قۆناخی خۆیدا (شەوی حەوتەم و شەوی بیست‌ویەکەمی مانگی کۆچی) بەرامبەر بە زەمین.

**تربیم** / terbiyom/: [فرانسوی/ انگلیسی]/*اسم.* تیربیۆم؛ توخمی کانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان بە ژمارەی ئەتومی ٦٥ و کێشی ئەتومی ١٥٨,٩٢وە.

**ترـترو** / terterû، ـها/: *صفت. /گفتاری، مستهجن/* ١. فیرنە؛ فێڕن؛ گیرۆدە بە فێڕکە و سک چوون ٢. */کنایی/* کز؛ سس؛ خۆنەگر؛ تڕکەلەک؛ تەڕاڵ.

**ترتیب** / tartîb، ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم.* ١. ڕیز؛ ڕیزبەندی؛ چۆناوچۆنی هەبوون یان دامەزراویی ئەندامانی یەک کۆمەڵە ‹ترتیب قد: ڕیزی باڵا› ٢. کار یان ڕەوتی چنین؛ ڕێک‌کردن؛ ڕیزکردن ‹ترتیب کتابها: چنینی کتێبان›.

▣ **ترتیب اثر دادن**: گوێ پێدان؛ ڕەچاو کردن؛ سەرنج پێدان ‹به نامه‌ام ترتیب اثر داده نشد: نامەکەم هیچ گوێی پێنەدرا›.

ترتیب **دادن**: ڕێک خستن؛ جێبەجێ کردن؛ پوخت‌کردن؛ سامان دان؛ ڕێک و پێک کردن؛ وسەیڕا؛ وەش‌کەردەی؛ پێکهێنانی پێشەکی کارێک یان ڕێخستنی ‹ترتیب آن کار را بده: ئەو کارە ڕێکخە›.

ترتیب **یافتن**: ڕێکخران؛ جێبەجێ بوون؛ بەڕێوەچوون؛ لوەی ڕاوە ‹جلسه‌ی انجمن ترتیب یافت: دانیشتنی کۆڕەکە ڕێکخرا›.

**ترتیبی** / tartîbî/: [عربی] *صفت.* ڕیزی؛ نۆبەیی؛ بەنۆرە؛ بەنۆگە؛ زنجیرەیی؛ یەک بە دوای یەک.

**ترتیزک** / tartîzak، ـها/: *اسم.* تەڕەتیزە؛ تەڕەتووڵە؛ تەڕەتوورە؛ تووزەک؛ دێژنک؛ ڕەشادۆک؛ گیاییکی یەک ساڵەیە گەڵاکەی دەخورێ، گوڵی سپی و سوورکاڵ و بۆنخۆشی هەیە: **ترەتیزک؛ شاهی**

**ترتیل** / tartîl، ـها/: [عربی]/*اسم.* تەرتیل؛ کار و ڕەوتی خوێندنی خێرای قورئان بە دەنگ و ئاهەنگەوە.

**ترجمان** / tarcomān/: [عربی]/*اسم.* ١. */قدیمی/* وەرگێڕ؛ پاچڤەکار؛ تەرجومان؛ دیلماج ٢. شاندەر؛ ڤەگۆ ‹ترجمان احساسات ماست: شاندەری هەستی ئێمەیە› ٣. */قدیمی/* پیتاک؛ تاوانە؛ تاوانێک کە لە بەرامبەر کارێکەوە دەدرێ.

**ترجمه** / tarcome/: [عربی]/اسم. ١. وەرگێڕان؛ پاچڤە؛ پاچەڤە؛ بەرچڤە؛ چێور؛ بژارە؛ کار یان ڕەوتی وەرگەڕاندنی نووسراوەیێک لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر ٢. /تراجُم//قدیمی/ ژیاننامە؛ بەسەرهات.

◘ **ترجمەی تحت‌اللفظی**: وەرگێڕانی دەق بە دەق؛ پاچڤەی وشە بە وشە.

◘ **ترجمە شدن**: وەرگێڕان؛ وەرگەڕان؛ وەرگێڕدران؛ پاچڤە بوونەوە.

**ترجمە کردن**: وەرگێڕان؛ پاچڤەکردن؛ چێوراندن.

**ترجیح** / tacîh/: [عربی]/اسم. هەڤیاز؛ دۆخ یان چۆنیەتی باشتر بوونی نرخ و برشتی کەس یا شتێک بە سەر ئەوانی دیکەدا.

◘ **ترجیح بلامرجح**: هاکۆ بژاردە؛ هەیکۆ بژێری؛ هەڵبژێری بە بێ هەڤیازی.

◘ **ترجیح دادن**: دان بە سەردا؛ هەڤیازدان؛ بە باشتر زانین؛ بەرتر و باشتر زانینی کەسێ یا شتێک ‹خواستگار بازاری را بە آقای مهندس ترجیح داد: داواکاری بازاڕی دا بە سەر ئاغەی موهەندیسدا›.

**ترجیح داشتن**: سەر بوون؛ چاکتر بوون؛ باشتر بوون؛ هەڤیاز بوون؛ خاستەر بیەی ‹پشم و پنبە بر الیاف مصنوعی ترجیح دارد: خوری و لۆکە لە هەودای دەستکرد سەرن›.

**ترجیحی** / tacîhî/: [عربی] صفت. سەر؛ هەڤیاز؛ باشتر.

**ترجیع‌بند** / tacî'band، ـها/: [عربی/فارسی] /اسم. هەڵبەستێک لە چەند چامەدا کە هەموو لە یەک کێشدان و هەر چەند بەستە لە ڕێژەیەکی تایبەت بە خۆیان کە لە کۆتایی هەر بەندێکدا چامەیەک دووپات دەبێتەوە.

**ترحلوا** / tarhalvā/: [فارسی/ عربی]/اسم. تەڕەهەڵوا؛ سەیلێ؛ هەڵوای بە ئاردی سووروەوەکراو، ڕۆن، گولاو و شەربەتی زۆر کە تەڕ دەبێ و زوو خەست نابێتەوە.

**ترحم** / tarahhom/: [عربی]/اسم. دڵسۆزی؛ بەزەیی؛ بەزەوی؛ بەزە؛ دلۆڤانی؛ میهرەوانی؛ ڕەحم؛ ڕوحم.

◘ **ترحم کردن**: دڵسۆزی کردن؛ دلسووتاندن؛ بەزەیی پێدا هاتنەوە؛ ڕەحم پێ کردن.

**ترحیم** / tarhîm/: [عربی] ☜ مجلس ترحیم، **مجلس**

**ترخون** / tarxûn, tarxon، ـها/:/اسم. تەرخون؛ ڕیشالوو؛ ڕیشالۆک؛ ڕیشالۆک؛ توونەگیواو؛ جۆرێک سەوزی خواردنە.

**ترخیص** / taxîs/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی هەڵساندن یان دەربازکردن؛ بەردان؛ ڕزگارکردن ‹امروز گندمهای وارداتی ترخیص شد: ئەورۆ گەنمە هاوردەکان دەرباز کران›.

**ترخیص‌کار** / tarxîskār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. دەربازکار؛ کەسێک کە ئەنجامدانی کاری گومرک و دەربازکردنی کالای ناردە یان هاوردەی بە ئەستۆیە.

**ترخینە** / tarxîne/:/اسم. دۆینە؛ دوینە؛ ترخێنە؛ تەرینە؛ چێشتێک لە دانەوێڵە (گەنم) و برێ جاریش سەوزی ئەنجراو کە لە ماست یان دۆدا دەیخەوێنن و دوایی وشکی دەکەنەوە و لە کاتی بەکار بردنیدا لە ئاودا دەیکولێنن تا وەکوو ئاش یان سووپی لێ بێ.

**ترد** / tord، ـها/: [عربی] صفت. تورت؛ توویر؛ ترت؛ ترد؛ پەژ؛ شکەڤا؛ شەق: ١. بەرەق؛ ئەوەی زوو دەشکێ ٢. ناسک؛ ناسکەڵە؛ تەرز؛ سەرتەرز. هەروەها: **تُردی**

**تردامن** / tardāman، ـها؛ ـان/: صفت. /کنایی، ادبی/ داوێن‌تەڕ؛ داوێن‌پیس؛ شواڵ‌چەپەڵ؛ شواڵ‌پیس؛ بەجووج.

تـــردد / taraddod، ـهـــا/: [عربـی]/اسـم. ۱. هـــاتوچـــوو؛ هـــاتوچـــۆ؛ ئامـــشۆ؛ ئامـــشەو؛ ئامۆشـۆ؛ ئامـشۆڕەفـت؛ ئامـەولـوەی ‹مـدتی بـه خانـەی مـا تـردد داشـت: مـاوەیـەک بـۆ مالـی مـه هـــاتوچـــۆی بـــوو› ۲. [قـــدیمی] دوودڵـــی؛ دڕدونگـــی؛ دۆخ یـــان چۆنیـــەتی بـــەگومـــان بوون.

تردســـت / tardast، ـهـا؛ ـان/: صفت. [مجازی] تـــەڕدەس؛ مـــەزبـــووت؛ چـــالاک؛ لۆتـــەر؛ دەسسـووک؛ دەسسـۆک؛ بـه دەسـت و بـرد؛ گورج و گۆڵ.

تردســـتی / tardastî، ـهـــا/: اسـم. [مجـازی] تـــەڕدەســـی؛ چـــابکی؛ چـــالاکی؛ لۆتـــەری؛ مەزبووتی؛ گورج و گۆلی؛ دەسترووسکی.

تردمـــاغ / tardamāq، ـهـــا/: صفت. [مجـازی] ســـەرخـــۆش؛ بـــەدەمـــاخ؛ بـــەکـــەیـــف؛ خۆشکەیف؛ سەرحاڵ؛ مەلەنگ.

تردیـد / tardîd، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. دوودڵـی؛ دڕدۆنگـــی؛ دڕدونگـــی؛ پـــاوەپـــایی؛ دڵ لـــه دلانی: ۱. گومـــــان؛ ژاژایـــــی؛ ڕاڕایـــــی؛ ناخاترجـەمـی؛ ئـەرێــ نـەرێـتی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتییێکـی زەیـنـی کـه لـه ئـەنجامـدان و جێبـەجـێکـردنی کارێکـدا ڕوو دەدا ‹تردیـد داشتم که بـروم یـان بمـانم: لـه دوودڵـیدا بـووم کـه بـڕۆم یـان بمێنمـەوە› ۲. شـک ‹ناگهـان در مـورد حرفش تردید کردم: لەنـەکـاو لـه مـەڕ وتـەکـەیـەوە کەوتمه شکەوە›.

تـــرس / tars، ـهـــا/: اسـم. تـــرس؛ تـــەرس؛ تـەرسـی؛ سـام؛ سـامی؛ یـاس؛ سـوهن؛ سـاو؛ هـــاس؛ بـــاک؛ زەرتـــلاق؛ ســـەیـــشت؛ پـــڕێ؛ خـەزە؛ قـورف؛ چـورچ؛ چـرچ؛ هـەراس؛ سـیم؛ تـــاو؛ زیـــلـــە؛ زیـــەلـــی؛ زار؛ زراو؛ زاور؛ تنـــاب؛ هەستێک که بـه هـۆی بـوون یـان بیرکـردنی مـــەترســـیێکەوە دەردەکـــەوێـــت و وێـــڕای گۆڕانێکی زۆر لـه لـەشدا، لـەگـەڵ دەرچـوون یان خۆ به دەستەوە دانەوەیە.

▣ ترس از آب: ئاونەوێری؛ ترس له ئاو.

ترس از آتش: ئاورنەوێری؛ ترس له ئاگر.

ترس از بلندی: بیماری ارتفاع ☜ **بیماری**

تـرس از رنـگ قرمـز: سـوورە ترسـی؛ تـرس له ڕەنگی سوور.

تـرس از کثافـت: وەسـواس؛ وازـواز؛ تـرس له پیسی.

▣ ترس برداشتن: تـرس داگـرتن؛ سـام گـرتن؛ ترسان؛ سامی کـەردەی؛ تـەرسـی گێرتـەیـره ‹وقتـی او را بـه آن حـال دیـدم تـرس بـرم داشـت: کاتێـــک ئـــەوم بـــەو حاڵـــەوە دی تـــرس دایگرتم›.

تـــرس داشـــتن: ترســـان؛ تـــرس بـــوون؛ تەرسـەی ‹از آن تـرس داشـت کـه نتوانـد بموقـع برسد: ترسی لەوە بـوو کـه نـەتوانێ بـه وەخـتی خۆی بگا›.

ترس کسی ریختن: ترسـی کـەسـێک شـکان؛ زاتی کەسـێ شـکیان؛ تـرس بـڕیان؛ سـامی مڕیەی؛ تـەرسـی شـیەی ‹چنـد بـار کـه سـوار شوی ترست می‌ریـزد: چـەن جـار کـه سـوار بی ترست دەشکی›.

تـرس نداشـتن: جـێ تـرس نـەبـوون؛ تـرس گـەرەک نـەبـوون؛ تـرس پـێ نـەویـستن؛ تـەرسـی گـەرەک نـەبیـەی ‹چـرا مـی‌ترسی؟ اسـب سـواری کـه تـرس نـدارد: بـۆچی دەترسـی؟ ئەسپسواری جی ترس نیه›.

از تـرس مـار بـه اژدهـا/ افعـی پنـاەبـردن: [مجـازی] لـه عـەزرەت سـەگـا خـۆ بـەدەم گورگـەوە دان؛ لـە ترسـی ئـاو پالـدان بـه ئاورەوە؛ له خۆفی خـراو پـەنـا بردنـه خراوتـر ‹تو داری از ترس مار به اژدها پناه مـی‌بـری: ئـەتـۆ خـەریکـی لـه عـەزرەت سـەگـا خـوت بـه دەمی گورگەوە دەدەی›.

ترسـا / tarsā، ـیـان/: صفت. [قـدیمی] عیـسایی؛

مەسێحی؛ خاچپەرست؛ فەلە؛ فلە؛ دیان.

**ترسائی** / tarsā'î/ ☜ **ترسایی**

**ترسان**[1] / tarsān/: *صفت.* ترساو؛ ترسیاگ؛ ترسیاو؛ زراوچوو؛ هەراسان ‹چهرەی ترسان: دیمەنی ترساو›.

**ترسان**[2]: *قید.* بە تەرس؛ بە ترسەترس؛ بە تەرسیەوە ‹ترسان و لرزان پیش می‌رفت: بە ترس و لەرزەوە دەڕۆیشتە بەرەوە›.

**ترساندن** / tarsāndan/: *مصدر. متعدی.* //**ترساندی**: ترساندت؛ **می ترسانی**: دە ترسێنی؛ **بترسان**: بترسێنە// ترساندن؛ تۆقاندن؛ ترس وەبەرنان؛ زات بردن؛ هەڵجنقاندن؛ ترسانن؛ ئەڵچورچەنن؛ هەراسانن؛ هەژقاندن؛ ڕاچەناندن؛ بزداندن؛ تەرسنەی؛ تەرسنای: **ترسانیدن**. هەروەها: **ترساندنی**

■ صفت فاعلی: **ترساننده** (ترسێنەر)/ صفت مفعولی: **ترسانده** (ترسێنراو)/ مصدر منفی: **نَترساندن** (نەترساندن)

**ترسانیدن** / tarsānîdan/ ☜ **ترساندن**

**ترس‌آور** / tarsāvar/: *صفت.* ترس‌هێنەر؛ تەرسێنەر؛ بترسێن؛ تەرسار؛ بە تایبەتمەندی یا بڕستی بەدیهێنانی ترس.

**ترسایی** / tarsāyî/: *اسم. [قدیمی]* عیسایی؛ مەسێحی؛ فەلەیی: **ترسائی**

**ترسخورده** / tarsxorde/: *صفت.* ۱. ترساو؛ ترسیاگ؛ ترسیاو؛ تۆقاو؛ هەراساو؛ ترس‌لێنیشتوو ۲. ڕەنگ‌بزڕکاو؛ خاوەن دۆخی بەرهەم هاتوو لە شاردنەوەی ترسێکی زۆر.

**ترسل** / tarassol/: [عربی]/ *اسم. [قدیمی]* نامەنقیسی؛ نامەنووسی.

**ترسناک** / tarsnāk/: *صفت.* خۆفناک؛ سامناک؛ جێ‌ترس؛ زەرند؛ گرتۆلە؛ بەسام؛ تەرسناک؛ تەرساوەر.

**ترسو** / tarsû، ـها/: *صفت. [گفتاری]* ترسەنۆک؛ ترسنۆک؛ ڕەقرەقۆک؛ بێجەرگ؛ قزە؛ بێ‌زات؛ بێ‌زاور؛ تسکەن؛ خنز؛ خیز؛ بزدونەک؛ دڵزراڤ؛ گەوش؛ نەوێر؛ چاڤ‌سست؛ کەوڕخ؛ کەلەزات؛ کەوجورەت؛ تەرسەزاڵ.

**ترس و لرز** / tars-o-larz/: *اسم. [گفتاری]* ترس و لەرز؛ ترس و خۆ؛ تەرس و لەرز؛ ترسی زۆر بەتایبەت هاوڕێ لەگەڵ لەرزینی لەشدا.

**ترسیدن** / tarsîdan/: *مصدر. لازم.* //**ترسیدی**: ترسای؛ **می‌ترسی**: دەترسی؛ **بترس**: بترسە// ترسیان؛ ترسان؛ بزدیان؛ چاوشکان؛ نەتەرەچوون؛ ئەڵچوورچەنن؛ ئەڵچورچیاین؛ پڕێ‌چین؛ ئەلورکیان؛ هەژڤین؛ بەزدین؛ سام‌کردن؛ هەڕاڤین؛ نەوێران؛ تەرسەی؛ تەرسای. هەروەها: **ترسیدنی**

■ صفت مفعولی: **ترسیده** (ترساو)/ مصدر منفی: **نترسیدن** (نەترسان)

**ترسیم** / tarsîm، ـها، ـات/: [عربی]/ *اسم. [ادبی]* کار یا ڕەوتی کێشان؛ ڕەسم‌کردن؛ دانانی خەت یان وێنەی خەتی لە سەر کاغەز و...

**ترش** / torš/: *صفت.* ترش؛ تورش؛ تش: ۱. چێژی دەم کووەکەر؛ یەکێک لە چوار چێژەی سەرەکی ‹سرکە ترش است: سرکە ترشە› ۲. بە چۆنیەتی یان دۆخی ترشاو بوون ‹خمیرترش: هەویرترش›.

▣ ترش شدن: تورشیان؛ ترشیان؛ تشیەی.

ترش کردن: *[مجازی، گفتاری]* تورشاندن؛ تشنەی؛ ترشاندن؛ ناو چاو دانە یەکا؛ ڕوو گرژکردن ‹تا آرام را دید ترش کرد: تا ئارامی بینی تورشاندی›.

ترش کردن معده: دڵەکزێ/ دڵەکزە/ زێڵەکزەگرتن؛ تورش‌کردنی گەدە؛ زۆر بوونەوەی ئەسیدی گەدە کە دەبێتە

هۆی کزانەوەی زگ و سووتانەوەی ناو قورگ.

**ترشا** / toršā/: اسم. *[نامتداول]* ترش؛ ئەسید.

**ترشال** / toršāl/: اسم. ترشیایی؛ تورشیایی؛ بۆن یان چێژەیەک کە لە ترشاویەوە هەست دەکرێ.

**ترشاندن** / toršāndan/: مصدر. متعدی. *[نامتداول]* // **ترشاندی:** ترشاندت؛ **میترشانی:** دەترشێنی؛ **بترشان:** بترشێنە// ترشاندن؛ تورشاندن؛ ترشانن؛ ترش‌هەلگەڕاندن؛ تشنەی؛ تشنای. هەروەها: **ترشاندنی**

■ صفت فاعلی: **ترشاننده** (ترشێنەر)/ صفت مفعولی: **ترشانده** (ترشێنراو)/ مصدر منفی: **نترشیدن** (نەترشاندن)

**ترشح** / taraššoh/: [عربی]/اسم. ـات/: تەراوشت؛ تز؛ دزاو؛ ئاودز؛ هلمدو؛ کار یان ڕەوتی نمدانەوە؛ دەلان؛ دەلاندن؛ شێ و تەڕایی دانەوە؛ لێدەرهاتن یان لێبوونەوەی تراو لە جێگایەکەوە ‹ترشح بزاق: تەراوشتی لیک›.

**ترشحی** / taraššohî/: [عربی] صفت. تەراوشتی؛ دەلاو؛ دەلیو.

**ترشرو** / tor(o)šrû/، ـها؛ ـیان/: صفت. *[مجازی، ادبی]* ڕووگرژ؛ ڕووترشاو؛ مۆن؛ ناوچاوتاڵ؛ ناوچاوترش؛ گەمۆر؛ خمل؛ ڕوومۆن؛ گرژ و مۆن.

**ترشرویی** / tor(o)šrûyî/، ـها/: اسم. ڕووگرژی؛ ڕووترشاوی؛ ناوچاوتاڵی؛ گەمۆری؛ گرژ و مۆنی.

**ترشک** / toršak/، ـها/: اسم. ترشۆکە؛ تورشکە؛ تورشێنەک؛ ترشێنک؛ تورشیکە؛ ترشکە؛ ترشۆک؛ ترشک؛ ترشکی؛ ترشکێ؛ تووشکە؛ تورێشکە؛ تێرشک؛ بەرەسماق؛ سیچک؛ سیچکی؛ سیچکە؛ گیاییکی چەندساڵەیە لە تیرەی ڕێواس، بنێکی ئەستووری هەیە کە بۆ دەرمان دەشێ.

**ترش و شیرین** / torš-o-šîrîn/: صفت. مزر؛ ترش و شیرین؛ مەیخۆش؛ مێخۆش؛ مەلەس؛ کەرمەلین؛ شەومنی؛ تش و شیرین؛ بە تامێکی پێکهاتوو لە ترشی و شیرینی ‹انگورها تازه ترش و شیرین شده بود: ترێ تازە مزر ببوو›.

**ترشی** / toršî/: اسم. ترشی؛ تورشی؛ تشی: ١. دۆخ یان چۆناوچۆنی تورش بوون ‹ترشی‌اش زیاد است: ترشیەکەی زۆرە› ٢. یەکێکە لە چوار تامە سەرەکیەکان کە مرۆ بە یارمەتی گرنجی زمان هەستی پێدەکا (وەک تامی سرکە) ٣. /ـها؛ ـجات/ ترشیات؛ بەرهەمێکی خواردەمەنیە لە سەوزی و میوەی پەروەردەکراو لە سرکەدا، کە زۆرتر لە ناو ژەم و لەگەڵ چێشتدا دەخورێت ‹ترشی بادمجان: تورشی بامجان› ٤. /ـها/ هەرکام لەو تام و چێژە ترشانەی کە دەیکەنە نێو چێشتەوە (وەک سرکە، ئاولیمۆ، ئاو قۆرە و...).

▣ **ترشی انداختن:** ١. ترشی‌گرتنەوە؛ ترشی چێکرن؛ تورشی خاسکردن؛ ترشی وەش‌کەردەی؛ لێنانی تورشی لە مێوە یان سەوزی ٢. *[کنایی]* گەنانەن؛ بێ‌کەلک‌کردن.

**ترشیجات** / toršîcāt/: (!) [فارسی/ عربی] جمعِ ☜ **ترشی**

**ترشیدگی** / toršîdegî/: اسم. ترشاوی؛ تورشیاگی؛ تورشیاوی؛ تشیایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تورشیاگ بوون.

**ترشیدن** / toršîdan/: مصدر. لازم. //**ترشیدی:** ترشای؛ **میترشی:** دەترشی؛ **بترش:** بترشە// ترشان؛ تورشان؛ ترشیان؛ تشیەی؛ تشیای: ١. ترش هەلگەڕان؛ ترشەڵۆک بوون ٢. *[مجازی]* سیسیان؛ ژاکان؛ دامریان؛ لە

دەسـدانی تاسـوخی و لـەبـاری. هـەروەهـا: **ترشیدنی**

■ صفت فاعلی: **ترشـنده** (ـــ)/ صفت مفعولی: **ترشـیده** (ترشـاو)/ مـصدر منفـی: **نترشـیدن** (نەترشان)

**ترشـیده** / toršîde، ـهـا/: *صـفت*. ترشـاو؛ تورشیاگ؛ تشیا؛ تورش هەڵگەڕاو.

**ترصـیع** / tarsî'/: [عربـی]/*اسـم*. ١. کـار و ڕەوتی ڕازاندنـەوە؛ جـەواهیرنیـشان‌کـردن؛ داکوتـانی جـەواهـیر بـە سـەر شـتێکدا ٢. *[بـدیع]* یـەک بـوونی کێـشی وشـەگـەلی دوو ڕستە یان دوو کەرت لە چامەیەکدا.

⊡ ترصیع کـردن: ١. جـەواهیرنیـشان‌کـردن ٢. تـەلاکـاری‌کـردن؛ زێـڕکاری‌کـردن؛ ڕازاندنـەوەی لاپـەڕەی کتێـب پـەرتووک بـە ئاوی زێڕ و ئیکلیل و...

**ترضـیه** / tarziye/: [عربـی]/*اسـم*. *[ادبـی]* دڵـنەوایـی؛ دلازایـی؛ کـار یـان ڕەوتی دڵ بـەجـێ هێنـان؛ شـادکردن؛ بـەجـێ هێنـانی ڕەزامەندی کەسێک.

⊡ **ترضـیه خاطر** کـسی کـردن: ڕەزامـەنـدی کەسێک بە دەست هێنان.

**ترعـه** / tor'e، ـهـا/: [عربـی]/*اسـم*. کانـاڵ؛ ڕەهەند؛ ئاوەڕا؛ جۆگـە؛ کـەندالـی دەسـکرد لـە نێـوان دوو چـەم یـان دوو زەریـادا بـۆ هات‌وچۆی گەمیە.

**ترعیب** / tar'îb/: [عربـی]/*اسـم*. *[ادبی]* کـار یـان ڕەوتی ترسـاندن؛ ترسـان؛ زات بـردن؛ تۆقاندن؛ تۆقنەی؛ تۆقنای.

**ترغیـب** / tarqîb/: [عربـی]/*اسـم*. هـان؛ دڵـگەرمـی؛ دڵ‌پـێ‌خۆشـکەری؛ کـار یـا ڕەوتی هـەڵگرسـاندنی هەسـتی خۆشـەویـستی و خوازیاری شـتێک لـە کـەسـێکدا ‹دایم او را بـه درس خواندن ترغیب مـی‌کـرد: هـەمیشە ئـەوی بـۆ خوێندن هان دەدا›.

**ترفنـد** / tarfand، ـهـا/: *اسـم*. پـێچ و پـڵووچ؛ فـێڵ؛ گـەڕ؛ گـزی؛ فـاک و فیـک؛ هـەنـگ؛ تەڵەکە؛ بڕەگەڕ؛ تـەشـخەڵـە؛ گـەڕ و گێچـەڵ؛ گزی‌وفزی؛ شندی‌ـمندی ‹با هر ترفندی کـه بود مادرش را بـه فـروش خانه راضی کـرد: بـه هـەر پـێچ‌وپـلووچێک بـوو دایکـی ڕازی‌کـرد ماڵـە بفرۆشێ›.

**ترفیـع** / tarfî'/: [عربـی]/*اسـم*. ١. کـار یـان ڕەوتی بـەرزکردنـەوە؛ پلـە و پایـەی کـەسـێ بردنـە بـان ٢. /ـهـا؛ ـات/ پلـە و پایـە؛ زێ ٣. کـار و ڕەوتی پێـشکەوتـن؛ هـەڵـچوون؛ پـەرە سەندن؛ هەڵدان؛ بان چوون.

⊡ ترفیع درجه: پلەگرتن؛ گـەیـشتن بـە پلـە و پایـەی بـانتر و بـەرزتـر. هـەروەهـا: **ترفیـع رتبه؛ ترفیع مقام**

⊡ ترفیـع یـافتن: بـەرز بوونـەوە؛ هـەڵـچوون؛ پایـە بـەرز بوونـەوە؛ گـەیـشتن بـە پلـە و پایەی بانتر.

**ترفیـه** / tarfîh/: [عربـی]/*اسـم*. *[ادبـی]* ئاسوودەیی؛ ئاسایشت.

⊡ ترفیـه خـاطر: ئاسـوودەیـی ڕەوان؛ ئاسایشتی ڕەوان؛ دڵدامەزراوی.

**تـرق‌ـتـروق** / taraqturûq/: *صـوت*. تـەق و پـۆق؛ تـەق و تـۆق؛ گـرم و هـۆڕ؛ زرمـەزرم؛ گرمـەگـرم؛ زرم و کـوت؛ شـریخ و هـۆڕ؛ دەنگی توند و پۆقـەی پێکدادانی شـتانێک یا تەقینەوەی لە دووی یەک: **تاراق‌ـتروق**

**تـرقص** / taraqqos/: [عربـی]/*اسـم*. *[قـدیمی]* هـەڵـپەڕکـێ؛ لـەیـز؛ کـار یـا ڕەوتی سـەمـا کردن؛ لیزتن؛ هۆرپڕەی؛ هۆرپڕای.

**ترقه** / taraqqe، ـها/: *اسـم*. تـەڕەقـە؛ فیشەکـە شێتە؛ کەسـپوون؛ گوڵـەتـەقـە؛ هـەرکـام لـەو تەقەمەنیانە کە بـە هـۆی لێـدان و کوتـان یـان گڕ پێوەنانەوە دەنگیـان لـێ دەبێتـەوە و زۆرتـر لە شەوانی شادیدا دەیانتەقێننەوە.

⊡ ترقه درکردن: تەرەقە تەقاندن.

**ترقــی** / taraqqî، ـهــا/: اعربــی]/اسـم. ١. پێشڕەوت؛ پێشکەوت؛ ئەوزینە؛ پایە بەرز بوونەوە ‹در کـارش ترقـی زیـادی کـرده: لـە کارەکەیدا زۆری پێشڕەوت کردووە› ٢. کار یان ڕەوتی چوونە سەر/ بان؛ بەرز بوونەوە؛ پەرە سەندن؛ هەڵدانەوە؛ هەڵچوون؛ هەڵبەزین؛ هۆروەسەی؛ هۆرلوەی؛ پێ زیاد بوون لە چۆنیەتی و چەندیەتی شتێک ‹قیمتها خیلی ترقی کرده: نرخەکان زۆر چوونەتە سەر›.

⊡ ترقی قیمت: چوونە سەری نرخ؛ بەرز بوونەوەی بەها؛ هەڵچوونی نرخ؛ گران بوون.

ترقی معکوس: [کنایی] هاتنە خوارەوە؛ دابەزان؛ داشکان؛ پاشڕەوت؛ پاشکەوت؛ ئەرەوسەی؛ ئەرەمریەی.

⊡ ترقی دادن: بردنە بان؛ بردنە سەرەوە: ١. پێش خستن؛ بەرەو پێش بردن؛ پەرە پێدان؛ ئەوزەینەدان ٢. فرەکردنی هەر شتێ. هەروەها: **ترقی کردن**

**ترقیخــــواه** / taraqqîxāh، ـان/: اعربـــی/ فارسی] صفت. پێشکەوتنخواز؛ لایەنگر و خوازیاری پێشکەوتنی ولات، کۆمەڵگا یان هەموو خەڵکی جیهان.

**تـــرک** / tarak، ـهـا/: اسـم. ١. زەنگ؛ درز؛ دەرز؛ ترەک؛ ترەکە؛ تەرەک؛ قرەک؛ تەرخ؛ گاز؛ درزێکی باریک کە نابێتە هۆی جوێ بوونەوەی دوو لەت لە یەکتری ‹یکی از بشقابها ترک برداشته است: یەکێ لەو دەوریەکان زەنگی بردووە› ٢. قەڕش؛ قەڵش؛ قڵش؛ تلیش؛ شڕەق؛ شەق؛ دەنمەز؛ دۆخی دەم بازکردنی شتێک (وەک قەڵشی کێو یان زەمین).

⊡ ترک برداشتن: زەنگ بردن؛ درز بردن؛ درز تێبوون؛ درز تێچوون؛ قلیشانەوە؛ شەق بوون؛ قەڵەش بوون؛ ترەک واردەی ‹سقف ترک برداشت: میچەکە درزی تێبووە›.

ترک خوردن: زەنگ بردن؛ ترەکین؛ ترەکیان؛ درز بردن؛ ترەک واردەی ‹آب داغ ریختم توی استکان، ترک خورد: ئاوی داخم کردە نێو پیالەکەوە زەنگی برد›.

**ترک** / tark:/اسم. ١. [عربی] تەرک؛ تەرخ؛ کار یان ڕەوتی بە جێهێشتن؛ دەس لێبەردان؛ وە لا نان؛ ئاسەی جگا؛ وسەی لاوە ‹سیگار را ترک کردن؛ خانه را ترک کردن: جگەرە تەرک دان؛ ماڵ بەجێ هێشتن› ٢. پشکە؛ پاشکۆ؛ تەرک ‹ترک دوچرخه: پشکەی دووچەرخە› ٣. /ـها/ تیکە؛ تەرکە؛ چاک ‹دامن چهار ترک: داوێنی چوار تیکە›.

⊡ ترک دوچرخه: پاشکۆی دووچەرخە؛ تەرکی دووچەرخە؛ جێگایێک لە سەر چەرخی دواینی دووچەرخەدا.

ترک عادت: واز هێنان لە خۆ ئەوەی کە هۆگر بووە؛ دەس لێکێشان و ڕەها کردنی خوو.

⊡ ترک دادن: پێتەرکدان؛ تەرک پێدان؛ پێبەردان؛ دەس پێ هەڵگرتن؛ هان دانی کەسێک بۆ دەس هەڵگرتن لە خوویەک ‹اولها خیلی دروغ می‌گفت، حالا ترکش داده‌ام: لە سەرەتاوە درۆی زۆری دەدا، بەڵام ئێستا پێم تەرک داوە›.

ترک شدن: لاچوون؛ برانەوە؛ کۆتایی پێهاتن؛ نەمان؛ لاشیەی؛ درێژەدار نەبوون ‹اعتیادش بر اثر معالجه ترک شد: گیرۆدەییەکەی بە هۆی دەرمانکردنەوە لاچوو›.

ترک کردن: ١. جێهێلان؛ بەجێ هێشتن؛ تەرککردن؛ ئاسەی جگا؛ جیا

بوونەوە لە کەسێ یا شوێنێک و دوور کەوتنەوە ‹کارگاه را ترک کرد: کارگاکەی بەجێ هێشت› ٢. وەلانان؛ بەلاوە نان؛ واز هێنان؛ دەس هەڵگرتن؛ تەرخ دان؛ نیایەوە لا؛ وێڵ کردنی کارێ یا ئاکارێک ‹مدتهاست سیگار را ترک کردەام: دەمێکە جگەرەم وەلا ناوە›. هەروەها: **ترک گفتن**

**ترک جان (سر) کردن/ گفتن:** *[ادبی]* دەس لە گیان بەردان/ کێشان؛ سەر دانان؛ واز لە گیان هێنان؛ لە خۆ بوردن و جوامێری کردن ‹در ره دوست ترک جان باید: دەس لە گیان بەردە لە ڕێی دلدارا›.

**بە ترک اسب/ دوچرخە/ موتور بستن:** شەتەک دان بە پشتی ئەسپ/ دووچەرخە/ موتورەوە. هەروەها: **بر ترک اسب/ دوچرخە/ موتور نشاندن**

**ترک** / tork، ـها؛ ـان؛ أتراک *[قدیمی]*/: *اسم.* ترک؛ تورک: ١. لە نژاد و ڕەگەزانی ئاسیایی ٢. هەر کام لەو کەسانەی کە زمانی زگماکیان تورکیە ٣. خەڵکی ولاتی تورکیا.

**ترکاندن** / tarakāndan/: *مصدر. متعدی.* //**ترکاندی:** ترەکاندت؛ **می‌ترکانی:** دەترەکێنی؛ **بترکان:** بترەکێنە// ترەکاندن؛ تەقاندنەوە؛ تەقاندن؛ توقانن؛ تەقنایوە؛ قلیشاندن؛ ترەقاندن؛ ترەکنەی؛ ترەکنای؛ بوونە هۆی قەڵشان یان درز بردن یا لێک‌جیا بوونەوەی شتێک ‹کوه را با دینامیت می‌ترکاندند: کێوەکەیان بە دینامیت دەتەقاندەوە›: **ترکانیدن**. هەروەها: **ترکاندنی**

■ صفت فاعلی: **ترکاننده** (ترەکێنەر)/ صفت مفعولی: **ترکانده** (ترەکێنراو)/ مصدر منفی: **نترکاندن** (نەترەکاندن)

**ترکانیدن** / tarakānîdan/ ☜ **ترکاندن**

**ترک‌بند** / tarkband، ـها/: *اسم.* تەرک‌بەند: ١. تەرکەبەند؛ بەن‌سامۆکە ٢. پەڕەیێکی کانزایی لە تەل چێندراو بۆ بار لێنان یا دانیشتن لە بان چەرخی دوای موتور یا دووچەرخەوە دایدەنێن.

**ترکتازی** / torktāzî، ـها/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* ١. *[مجازی]* هێرش؛ هەڵمەت ٢. تالان؛ چەپاو؛ پووڕ؛ تالان و تاژان؛ تالان و مالان.

**ترک‌خوردگی** / tarakxordegî، ـها/: *اسم.* تلیشاوی؛ قلیشاوی؛ قەڵشت‌بردوویی؛ درز تێکەوتوویی؛ ترەک واردەیی؛ دۆخ یا چۆنیەتی پەیدا بوونی درز لە شتێکدا.

**ترک‌سوار** / tarksavār، ـها؛ ـان/: *اسم.* پشتەسوار؛ پشکەسوار؛ کەسێ کە لە تەرکی چوارپێ، موتور یان دووچەرخەوە دادەنیشێ.

**ترکش** / tarkeš، ـها/: *اسم.* ١. پلاشە؛ پریشە؛ تیکەی گولله، قومپارە، بۆمبا یا نارنجۆک کە بە هۆی تەقینەوەوە لێی جوێ بۆتەوە ٢. *[قدیمی]* تیردان؛ هەگبەی تیران؛ جێگەی تیری کەوان کە هەڵیاندەواسیە لا کەلەکەوە.

▣ آخرین تیر ترکش ☜ **آخرین**

**ترکمان** / torkamān/ ☜ **تُرکَمَن**

**ترکمن** / torkaman/: *اسم.* تورکەمەن؛ تورکمان: ١. هۆزی سپی پێستی تورک، دانیشتووی ئاسیای ناوین، تورکەمەنستان و لای باکووری ڕۆژهەلاتی ئێران ٢. ـها؛ ـان؛ تراکمە *[قدیمی]* هەرکام لە کەسانی ئەو هۆزە: **ترکمان**

**ترکمنی** / torkamanî/ *صفت.* تورکەمەنی؛ سەر بە تورکەمەن؛ پێوەندیدار بە ڕەگەزی تورکەمەنەوە.

**ترکمون** / terekmûn/: *اسم. [مستهجن]* ١. ڕیان؛ گووکردن ٢. *[مجازی]* گەنەکاری؛ گووکاری؛ کارتێکدەری؛ خراوکاری ‹این

رفیق تو هم که ترکمون کرد: ئەم دۆستەشت خۆ کەنەکاری کرد›.

**ترکه** / tarake/: [عربی]/اسم. میرات؛ پاشماوە؛ کەلەپوور؛ کەلەپۆڕ؛ مەردەلا؛ماڵی بەجێماو لە مردوو.

**ترکه**[1] / tarke، ـها/: اسم. شووڵ؛ چووڵە؛ شات؛ شمڕ؛ شووول؛ کاشووڵک؛ شووڵک؛ شوو؛ تەنکە؛ تووڵ؛ تووڵە؛ توویل؛ تەرکە؛ خۆس؛ خامە؛ شاتە؛ لەق و ساقەی باریکی دار.

**ترکه**[2]: صفت. [مجازی] ١. باریک؛ ناسک؛ تولە ٢. بەژنزراڤ؛ باریکەڵە؛ تەنکەڵە؛ تەنکوتیووڵ؛ بەژن باریک و ڕێک ٣. لەڕ؛ لاواز؛ ڕەقوتەق.

**ترکه‌ای** / tarke'î، ـها/: صفت. [مجازی، گفتاری] تەنکە؛ تەنکەڵە؛ باریک و جوانکیلانە.

**ترکی**[1] / torkî/: [ترکی]/اسم. ١. تورکی؛ هەر کام لە دەستە زمانگەلی سەر بە ناوچەی ئاسیای ناوین لە زمانەکانی ئۆراڵ–ئالتایی ٢. پەراوێزی پارچە کە پڕ و چڕ هۆندراوە.

▣ **ترکی آذری**: تورکی ئازەری؛ زمانی خەڵکی ئازەربایجان.

**ترکی استانبولی**: تورکی ئەستەمۆڵی؛ زمانی خەڵکی باکوور و ڕۆژاوای تورکیا.

**ترکی شرقی (خاوری)**: تورکی ڕۆژهەلاتی؛ زمانی تورکی خەڵکی ئاسیای ناوەندی.

**ترکی غربی**: تورکی ڕۆژاوایی؛ زمانی تورکی خەڵکی ئازەربایجان و تورکیا.

**ترکی**[2]: صفت. تورکی؛ ترکی؛ سەر بە ترک؛ پێوەندیدار بە ترکەوە ‹غذای ترکی: چێشتی تورکی›.

**ترکیب** / tarkîb/: [عربی]/اسم. ١. تێکەڵی؛ تێکئالاوی؛ لێکدراوی؛ هەڤدودانین؛ کار یا ڕەوتی یەکگرتنی دوو یا چەن شت بە شێوەیێک کە لە ئاکامدا ببنە یەک شت ٢. تەشک؛ دوخت؛ نژم؛ بیچم ‹بد ترکیب: بەو تەشک› ٣. [شیمی] تێکئالاو؛ دارشتە؛ پێکهاتە؛ چۆناوچۆنی یەکگرتنی توخمگەلی جۆراوجۆر بە شێوەیەک کە لە ئاکامدا یەک ماکی کیمیاوی پێک بێنن ٤. /ـها؛ ـات/[شیمی] تێکئالاو؛ دارشتە؛ پێکهاتە؛ ئەو شتەی کە لە یەکگرتنی توخم یا ماکەوە ساز دەبێت ‹آب ترکیب دو عنصر اکسیژن و هیدروژن است: ئاو تێکئالاوی دوو توخمی ئوکسیژن و هیدرۆژنە›.

▣ **ترکیب شدن**: تێکەڵ بوون؛ یەکگرتن ‹چربی با آب ترکیب نمی‌شود: چەوری لەگەڵ ئاودا تیکەل نابیت›.

**ترکیب کردن**: تێکئالان؛ لێکدان؛ تێکەڵکردن؛ تەڤلهەڤکرن؛ بە شێوەی تەنی لێکدراو دەرهێنان ‹آب را با فلز سدیم ترکیب کرد: ئاوی لەگەڵ کانزای سودیومدا تیکئالاند›.

**ترکیب‌بند** / tarkîb.band/: [عربی/ فارسی] اسم. [ادبیات] هەڵبەستێک لە چەند چامەدا کە هەموو لە یەک کێشدان و هەرچەند بەستە لە یەک ڕێزدان.

**ترکیب‌بندی** / tarkîb.bandî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. کار یان ڕەوتی ڕێکوپێک کردن و چنین بە پێی ڕێژە و پەیوەندیگەلی دروست، بەتایبەت لە ئاسەوارێکی هونەریدا.

**ترکیدگی** / tarakîdegî، ـها/: اسم. ترەکاوی؛ ترەکیاگی؛ ترەکیایی؛ تلیشاوی؛ قەڵشیاوی؛ دۆخ یا چۆنیەتی قەڵشان یان شوێنێ کە قەڵشیوە.

**ترکیدن** / tarakîdan/: مصدر. لازم. //**ترکیدی**: ترەکیای؛ **می‌ترکی**: دەترەکی؛

**بتـرک:** بتره‌که// ١. تـره‌کـین؛ زه‌نـگ بـردن؛ پەڕتـین؛ شـه‌ق بـردن؛ قـه‌ڵـشیان؛ تـره‌کیـان؛ تـره‌کیـه‌ی؛ تـره‌کیـای؛ لـێ‌پـه‌یـا بـوون و ده‌رکـه‌وتـنی درز یـا قـه‌ڵـش لـه دیوارۆکـه‌ی شتێک به هـۆی پـه‌سـتاویه‌تی یـان گوشـاره‌وه ‹شیشه ترکید: شووشـه‌کـه تره‌کی› ٢. تـه‌قـین؛ ته‌قینـه‌وه؛ تـه‌قـه‌یـوه؛ فـره‌قـین ‹ترکیدن ترقه: تـه‌قینـی تـه‌ره‌قـه› ٣. تـره‌کـین؛ تـره‌کیـان؛ تره‌ک بـردن؛ ئـه‌وه‌تـره‌کـه‌ی؛ قـه‌ڵـش بـردنی پێست یان ئێسقان بـه هـۆی نـه‌خۆشـین یـان کوتیانه‌وه ‹ترکیدن پوست: تـره‌کیانـی پێـست›.

هه‌روه‌ها: **ترکیدنی**

■ صـفت مفعـولی: **ترکیـده** (تـره‌کـاو)/ مـصدر منفی: **نترکیدن** (نه‌تره‌کین)

**تر گـــــل‌ور گــــل** / targolvargol/: صـفت. *[گفتاری]* جوانکیلـه؛ شـۆخ و شـه‌نـگ؛ ڕێـک و پێک؛ ناسـک و نـازدار؛ کـۆک و پۆشـته؛ شـۆخ و له‌بار؛ جوان و چه‌له‌نگ؛ نـه‌رمـه‌نیـشک؛ تـه‌ڕ و تـه‌مـیس؛ خـشپن؛ شـاد و ڕازاوه ‹دو تـا بچـه‌ی ترگـل‌ورگـل هـم همـراهش بودنـد: دوو منداڵی جوانکیله‌یشی له‌گه‌ڵ بوون›.

**ترلان** / tarlān/ ☜ **شهباز**

**ترلیون** / t(e)reliyon/: [فرانسوی] ☜ **تریلیون**

**تـرم** / term، هـا/: [فرانسوی]/اسـم. ١. کـه‌ش؛ نیوسـاڵ؛ تیـرم؛ چـه‌ل؛ مـاوه‌یـه‌کـی دیـاریکراو لـه سـاڵ کـه چـه‌نـد ده‌رسـی تایبـه‌تی تێیـدا ده‌خوێنـدرێ ٢. *[نامتـداول]* ده‌سـته‌واژه؛ زاراوه.

**ترمبـوز** / toromboz/: [؟]/اسـم. *[پزشـکی]* ترۆمبۆز؛ دروست بوونی ده‌ڵـه‌مـه‌ی خـوێن لـه ناو ده‌ماردا: **ترومبوز**

**ترمتـای** / toromtāy، هـا/: [؟]/اسم. توورومتـه؛ ترۆمتـه؛ هـه‌ڵـه‌کـه‌سـه‌مـا؛ هـه‌ڵـه‌کـه‌سـه‌مـا؛ هێله‌که‌سـه‌مـا؛ مـشه‌گـره؛ سـه‌ماکـه‌ره؛ تـیره؛ چه‌ند جـۆره مـه‌لی ڕاوکـه‌رن لـه تـیره‌ی بـاز و شه‌هێن.

**ترمـز** / tormoz، هـا/: [روسـی]/اسـم. تـورمز؛ ئـامێری وه‌گـری گـه‌ڕان لـه کـه‌ره‌سـته‌ی ڕاگوێزه‌ری چه‌رخداردا.

◙ ترمز الکتریکی: تورمزی کاره‌بایی.

ترمز بـادی: تـورمزی بـایی؛ جۆرێـک تـورمز کـه بـه هێـزی گوشـاری بـاوه کـار ده‌کـا: **ترمز کمپرسی**

ترمز پـایی: تـورمزی پـایی؛ تـورمزێ کـه بـه هێزی پا کار ده‌کات.

ترمـز روغنـی: تـورمزی ڕه‌وغـه‌نی؛ تـورمزێ کـه بـه یاریـده‌ی گوشـاری ڕه‌وغـه‌ن کـار ده‌کات.

ترمز کمپرسی ☜ **ترمز بادی**

◙ ترمز بریدن: تورمز بـڕیان؛ تـورمز بـڕین؛ لـه کار که‌وتن و عه‌یبدار بوونی تورمز.

ترمـز کـردن: تـورمزکردن؛ وه‌سـتان؛ ڕاوه‌سـتان؛ بـه کـار هێنـانی تـورمز بـۆ وه‌ستان.

**ترموالکتریـسیته** / termo'elektirisîte, 'elektrisîte-/: [فرانسوی]/اسم. گـه‌رمابـه‌رق؛ کاره‌بای به‌دیهاتوو له هێزی گه‌رما.

**ترموالکتریـک** / termo'elektirik, -'elektrik/: [فرانسوی] صفت. گـه‌رمابـه‌رقـی؛ شـێوازی به‌دیهێنانی کاره‌با له هێزی گه‌رما.

**ترمـوتراپی** / termot(e)rāpî، هـا/: [فرانسوی]/اسم. گـه‌رمـاده‌رمـانی؛ کـار و ڕه‌وتی ده‌رمان‌کردن به تین و گه‌رما.

**ترمودینامیـک**/ termodînāmîk/: [فرانسوی] /اسم. تیرمۆدینامیـک؛ لقێـک لـه زانـستی فیزیـک کـه لـه قانوونگـه‌لی زاڵ بـه سـه‌ر گه‌رما و مانه‌وه‌ی وزه‌وه ده‌کۆڵێته‌وه.

**ترمـوس** / termûs، هـا/: [فرانسوی]/اسم. مـه‌تـاره؛ سـارد و گـه‌رم؛ ده‌فرێکـی دوو پۆشـه که ئـاو (تـراو) تـا مـاوه‌ی زۆر بـه سـاردی یـان

گەرمی ڕادەگرێت.

**ترموست** / termoset/: [فرانسوی] *صفت.* گەرماسەخت؛ بێتایبەتمەندی نەرم بوونەوە لە بەرامبەر گەرماوە؛ پێچەوانەی گەرمانەرم.

**ترموستات** / termostāt، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* تیرمۆستات؛ ئامێری خۆکار بۆ ڕاگرتنی تینی جێگایەک یان دەزگایەک لە سۆنگەی بە کار خستن یان لە کار خستنی ئامێری گەرم یان ساردکەرەوە: **دماپای**

**ترموکوپل** / termokûpl، ـها/: [فرانسوی] /*اسم.* تێرمۆکووپل؛ ئامێرێک بۆ ئەندازە گرتنی تین لە دەزگایێکدا.

**ترمومتر** / termometr، ـها/: [فرانسوی] ☜ **دماسنج**

**ترمه** / terme/:/*اسم.* ترمە؛ تورمە؛ قوماشێکی دەسچن لە خوری و ئاوریشم کە نەخشی جوان و ڕازاوەی کۆنی لە سەرە و زۆرتر بۆ دروستکردنی بەرماڵ و مەوج و کۆڵەجەمە و... کەلکی لێ دەگرن.

**ترمی**¹ / termî/: [فرانسوی]/*اسم.* ترمی؛ یەکەی گەرما کە دەکاتە ١٠٠٠ کیلۆکالوری.

**ترمی**²: *صفت.* ترمی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ترمەوە.

**ترمی**³: *قید.* ترمێک؛ ترمێ؛ ترمێو؛ لە هەر ترمدا ‹ترمی ۱۴ واحد درس دارد: ترمی ١٤ واحد وانەی هەیە›.

**ترمیت** / termît/: [؟]/*اسم.* ترمیت؛ کاربیت؛ تێکەلاوێک لە گەردەی ئالومنیۆم و ئۆکسیدێکی کانزایی (وەک ئاسن) کە ئەگەر ئاور بگرێ گەرمایەکی یەکجار زۆر بار دێنێ و لە جۆشکاری و سازکردنی بۆمبای ئاگریندا بە کار دێ.

**ترمیم** / tarmîm، ـها/: [عربی]/*اسم.* ١. کار یان ڕەوتی سازکردنەوە؛ چێکردنەوە؛ خاسکردنەوە؛ خۆشکردنەوە؛ وەشەوەکەردەی؛ چێکردنەوەی شتێکی ڕووخاو، شکاو یان لە کارکەوتوو ٢. *[زیستشناسی]* گۆشتەوزوون هێنانەوە؛ خوەش بوونەوە؛ سازانەوە؛ خاس بوونەوەی پەلی زیان لێکەوتوو ‹ترمیم سوختگی بازو: گۆشتەوزوون هێنانەوەی سووتاوی باسک›.

◘ **ترمیم کابینه**: گۆڕینی شالیار؛ کار یان ڕەوتی لابردن یان جێگۆڕکێی چەند وەزیر، بێئەوەی کە دەوڵەت هەڵوەشێتەوە.

**ترمیمی** / tarmîmî/: [عربی] *صفت.* سازکردنەوەیی؛ سازانەوەیی؛ خۆشکەرانە؛ خۆشکەرەوەیی.

**ترمینال** / termînāl، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* ترمینال؛ گاراژ؛ گاراج؛ جێگایەک کە کەرەسەگەلی ڕاگویزان لەوێوە بەرەو شوێنگەلی جۆراوجۆر ڕێ دەکەون: **پایانه**

**ترمینولژی** / termînolojî/: [فرانسوی]/*اسم.* ١. زاراوەناسی ٢. /ـها/ زاراوەنامە؛ فەرهەنگی زاراوە و وشەی باو لە هەر لقێکی زانستدا.

**ترن** / t(e)ran، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* قەتار؛ شەمەندەفەر؛ تیرەن.

**ترنا** / tornā/:/*اسم.* شیپ؛ دەسماڵێکی زۆرتر هەورێشمی کە بای دەدەن و لە قاپێندا بە جێی قامچی بە کاری دەبەن.

**ترنابازی** / tornābāzî/:/*اسم.* قاپێن؛ شا و وەزیر؛ جۆرێک یاریە کە یاریگەران لە رووی نیشتنی قاپ یان قوتوو شەمچەیەکەوە، شا و وەزیر و دز و جەلاد دیاری دەکەن و جەلاد بە دەستووری شا و بە پێی ڕاوێژی وەزیر سزای دزەکە دەداتەوە.

**ترنج** / toranc، ـها/:/*اسم.* ١. تورنج؛ تورەنج؛

نەخشێکی ئێرانیە بۆ جوانکاری لە چنراوە و نیگارکێشیدا (وەک نەخشی گەورەی ناو قالی) ٢. ☜ **بالنگ۔٢**

**ترنجبین** / tarancabîn /: [معرب از فارسی] *اسم.* ترنجەمین؛ ترنجەبین؛ دەرمانێکە لە ڕوەکی وشترخار ساز دەبێ و بۆ زگ کار کردن باشە.

**ترنجیدن** / torancîdan /: *مصدر. لازم. [نامتداول]* ١. هەڵچرچان؛ چرچیان؛ چرمقین؛ مرچقین؛ قورمسان؛ قرمچین؛ تورسین؛ چوونە یەک؛ چرچهەلاتن؛ سیس بوون؛ لۆچ بە سەر یەکدا هاتن؛ بە هۆی زۆر و گوشارەوە قەد بوون؛ لە تەشک کەوتن و قوپان ٢. *[مجازی]* تەمران؛ پشت شەق بوون؛ تووشیاری کوڵ و کەسەر بوون.

■ صفت مفعولی: **ترنجیده** (هەڵچرچاو)

**ترنجیده** / torancîde /: *صفت.* هەڵچرچاو؛ چرچهەلاتوو؛ قوپاو؛ لەبارکەوتوو؛ کرژبووگ.

**ترنم** / tarannom /: [عربی] *اسم. [ادبی]* سۆزە؛ سۆز؛ گازە؛ مۆرە؛ لۆرە؛ کار یان ڕەوتی ئافراندنی دەنگی خۆشتەرز، بەتایبەت ئاهەنگێکی مۆسیقایی.

⊡ **ترنم کردن:** نێورین؛ لۆراندن؛ لۆرە کردن؛ سۆزە کردن؛ سۆزکردن؛ نەرمە نەرم و لەبەرخۆوە گۆرانی گوتن.

**به ترنم درآمدن:** کەوتنە لۆرەلۆرەوە؛ بە لۆرەلۆرکەوتن؛ هاتنە سۆزەوە؛ هاتنە دەنگەوە؛ کەوتنە گۆرانی گوتنی نەرمە نەرم و لەبەرخۆوە.

**تروتازگی** / tar-o-tâzegî /: *اسم.* تەڕ و تازەیی؛ گەشکەیی؛ تەرچکی؛ تەرجگی؛ گەشی؛ دۆخ یا چۆنایەتی تەڕ و تەمیس و نوێ بوون.

**تر و تازه** / tar-o-tâze /: *صفت. [گفتاری]* تەڕ و تازە؛ شەق و تێراو؛ گەشکە؛ گەش؛ تەرچک؛ تەرجگ؛ پاراو؛ پایناو؛ تازە و گەشاوە ‹گلهای تر و تازه: گوڵانی تەڕ و تازە›.

**تروتسکیسم** / t(e)roteskîsm /: [؟] *اسم.* ترۆتسکیسم؛ ئامۆژەی سیاسی۔کومەلایەتی لۆترۆتێسکی، شۆرشگێری ڕووس (١٨٧٧-١٩٤٠ زایینی).

**تر و تلیس** / tar-o-telîs /: *صفت. [گفتاری]* تەڕ و تلیس؛ تەڕ و تەلیس؛ تەڕ و بەڕ؛ تەڕ و بڕ؛ تەڕ و بەل؛ تەڕ و شۆ؛ خووساو؛ خووسیاگ؛ فیسیا؛ تەواو تەڕ.

**تر و تمیز** / tar-o-tamîz /: [فارسی از عربی] *صفت. [گفتاری]* پاک و خاوێن؛ پاک و پوختە؛ تەڕ و تەمیس؛ بژوون؛ هیلاو؛ خاوێن ‹همە جا را تر و تمیز کردم: گشت جێیەکم پاک و خاوێن کردەوە›.

**تر و چسب** / tar-o-časb /: *قید.* گورج؛ کرژ؛ گورج و گۆڵ؛ کرژ و کۆڵ؛ خێرا؛ دەسبەجێ؛ دەزبەجێ؛ هەر لە جێوە؛ دزبەجێگا؛ یەکتەکان؛ یەکتەقە؛ دەرلاد؛ دەمودەس؛ هەر نهۆ؛ بەبێ وچان و بە زووترین کات.

**ترور** / teror /، ـها: [فرانسوی] *اسم.* ١. تیرۆر؛ ڕەشەکوژی؛ تەریەگەری؛ کاری پەنامەکی و بە دزیەوە بۆ کوشتنی کەس یان کەسانێک ٢. *[نامتداول]* ترس.

⊡ **ترور شدن:** تیرۆر بوون؛ چەپ و خاڵ کوژران ‹ناصرالدین شاه در شاه‌عبدالعظیم ترور شد: ناسرەدین شا لە شاعەبدولعەزیمدا تیرور کرا›.

**ترور کردن:** ڕەش‌کوژتن؛ تیرۆرکردن؛ چەپ و خاڵ و بە ماتەوە دەست بۆ کوشتن بردن ‹میرزا رضای کرمانی او را ترور کرد: میرزا ڕەزای کرمانی تیروری کرد›.

**تِرُورِیست** / terorîst، هـا/: [فرانسوی]/اسم. ڕەشکوژ؛ تیرۆریست؛ کەسێ کە دەست بە کاری تیرۆرە یان باوەڕمەند بە وەها ئاکارێکە.

**تروریست**²: صفت. تەریەگەر؛ ڕەشکوژ؛ باوەڕمەند بە ڕەشکوژی.

**تِروریستی** / terorîstî/: [فرانسوی] صفت. تەریەگەری؛ تیرۆریستی.

**تروریسم** / terorîsm/: [فرانسوی]/اسم. ڕەشکوژی؛ کەلک وەرگرتن لە تیرۆر وەک ڕێبازێک بۆ دەستکەوتنی ئامانج.

**تَر و فِرز** / tar-o-ferz/: صفت. [گفتاری] چالاک؛ گورج و گۆڵ؛ کرژ و کۆڵ؛ بە دەستوبرد؛ خێرا؛ بزێو ‹آزاد در این کارها خیلی تر و فرز است: ئازاد لەم کارانەدا زۆر چالاکە›.

**تر و فرز**²: قید. [گفتاری] خێرا؛ گورجێ؛ کرژ؛ بە چالاکییەوە ‹تر و فرز دستش را گرفت؛ تر و فرز از پلەها بالا رفت: بە چالاکییەوە دەستی گرت؛ گورجێ بە پلەکاندا چووە سەر›.

**تروکاژ** / t(u)rûkāj/: [فرانسوی]/اسم. ترووکاژ؛ کار یان ڕەوتی کەلکوەرگرتن لە ئامێر و فەن و فێڵ لە کاری سینەماییدا بۆ نیشاندانی ڕووداوگەلێک کە بە شێوەی ئاسایی ڕوونادەن یان نابیندرێن.

**ترومبوز** / t(o)romboz/: [فرانسوی] ☜ **تُرُمبوز**

**ترومبوسیت** / t(o)rombosît/: [فرانسوی]/اسم. گردەی خون ☜ **گِردە**

**ترومبون** / t(o)rombon, terombon، هـا/: [فرانسوی]/اسم. ترۆمبۆن؛ لە سازە بایی و شەیپوورییەکان بە دوو لوولەی چەماوە، کە لوولەی لای دەمی ژەنیارەکە لە ناو لوولەیەکیترەوە بەر و دوا دەکا و دەنگی جۆراوجۆری لێدەبێتەوە.

**ترومپت** / torompet, t(e)rompet، هـا/: [فرانسوی]/اسم. ترۆمپێت؛ ئامرازێکی مووسیقایە وەکوو شەیپوور بە سێ کونەوە، کە بە گێڕانی دەم و جێبەجێ کردنی ئەنگوست لە سەر ئەو سێ کونە دەنگی لێدەبێتەوە و دەژەنرێ.

**ترویج** / tarvîc/: [عربی]/اسم. ١. هەرمێن؛ ڕمێن؛ کار یا ڕەوتی برەو پێدان و وەگەڕ خستن و باو پێدان ‹ترویج دادن: برەو پێدان› ٢. پەرە؛ گەشە؛ پێشرەفت؛ کار یان ڕەوتی گەشە پێدان؛ پەرە پێدان؛ پێشەو چوون ‹ترویج کشاورزی: گەشە پیدانی کشت و کاڵ›.

▣ **ترویج دادن**: وەبرەو خستن؛ برەو پێدان ‹ترویج دادن قانون اساسی: برەو پیدانی قانوونی بنەمایی›.

**تْرویرا** / t(e)revîrā/: [؟]/اسم. تیرڤیرا؛ ناوی بازرگانی جۆرێک بەن و ڕیشاڵی پولیستر.

**تَره** / tare، هـا/: اسم. ١. کەوەر؛ کەورگ؛ کۆرگ؛ کەڤەر؛ کەوەری؛ کەوەرگ؛ گورەو؛ کاڕاد؛ کەرەسا؛ کەرەوزان؛ سەوزیەکی دەست چێنی تیژە کە بنەکەی چەند ساڵ دەمێنێتەوە ٢. هەر جۆرە سەوزێکی خواردەمەنی.

▣ **تره بار کسی نکردن** ☜ **تره برای کسی خرد نکردن**

**تره برای کسی خرد نکردن**: [کنایی] گوو بە کڵاوی کەسێ نەپێوان؛ نرخ و گرنگایەتی نەدان بە کەسێک: **تره بار کسی نکردن**

**تُرَّهات** / torrahāt/: [عربی]/اسم. [ادبی] هەڵیت و پەڵیت؛ پڕ و پووچ؛ شات و شووت؛ یاوەیاو؛ هات و هووت؛ قسەی قۆڕ؛ گیوەگیو؛ لافوگەزاف؛ قسەی گۆترە و بێواتا ‹این ترهات چیست کە بە هم میبافی: ئەم هەڵیتوپەڵیتە چیە دەیانڕیسی›.

**تره‌بار** / tarebār/: اسم. تەڕەبار؛ باری بێستان؛ ناوی گشتی سەوزەوات و میوەی خۆراکی.
**تره‌تیزک** / taretîzak/ ☜ **ترتیزک**
**تری** / tarî/: اسم. تەڕی؛ ئاوداری؛ تەڕایی؛ شێداری؛ بە ئاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تەڕ بوون.
**تریا** / ter(i)yā/: [از فرانسوی] ☜ **کافه‌تریا**
**تریاسه** / teryāse/: [از فرانسوی/ از آلمانی] اسم. تیریاسە؛ ئەوەڵین دەور لە دەورانی دووهەمی زەوی‌ناسی، نێوان ۲۲۵ میلیۆن تا ۱۹۰ میلیۆن ساڵی لەمەو پێش.
**تریاق** / taryāq، ـها/: [معرب از یونانی] اسم. [قدیمی] دژەژار؛ دژەژەهر.
**تریاک** / taryāk, teryāk، ـها/: [یونانی] اسم. تریاک؛ تلیاک؛ شیلەی خاشخاش کە تازەکەی سپیە و پاش ماوەیەک دەبێتە ڕەنگی کەمکۆڵی ئاماڵ زەرد.
**تریاکی** / taryākî, teryākî/: [یونانی] صفت. تریاکی: ۱. پێوەندیدار بە تریاکەوە ۲. بە ڕەنگی تریاک ۳. /ـها؛ ـان/ تریاک‌کێش؛ تریاک‌خۆر.
**تریبون** / t(e)rîbon, tirîbon، ـها/: [فرانسوی] اسم. تریبۆن: ۱. مێزێکە کە بێژەر بۆ پەیڤین دەڕواتە پشتیەوە ۲. سەکۆیەکی بەرزە کە وتارخوێن یا بێژەر دەڕواتە سەری ڕادەوەستێ ۳. [مجازی] جێگایەک بۆ دەربڕینی بیروڕای کەس یان تاقمێک ‹تلویزیون شده بود تریبون یک گروه سیاسی: تەلەفزیۆن ببووە تریبونی تاقمێکی ڕامیاری و بەس›.
**تریپلکس** / tirîpleks, t(e)rîpleks/: [؟] صفت. سێ‌نیوقات: ۱.ماڵێکی سەربەخۆ لە سێ نهۆمدا بە ڕیزە پلەکانێکی ناوخۆییەوە ۲. سیستەمی خاوەن سێ دەزگا یان خولگەی سەر بە خۆی بە یەکەوە بەستراو.
**تریتیم** / tirîtiyom, t(e)rityom/: [؟] اسم. تریتیۆم؛ توخمی ئیزوتۆپی هیدرۆژن، بە کێشی ئەتومی ۳،۰۱۶ وە.
**تریج** / tirîc, terîc/: اسم. [قدیمی] تێرنج؛ تیرنجێ؛ تیریجە؛ پەراوێزی بەرگ و شمەک.
▣ به تریج قبای کسی برخوردن: [کنایی] دان لە گەنەی دەماخ کەسێک؛ بە نابەجێ دڵ لە کەسێک ئێشان ‹به او گفتم کمی زود بیا به تریج قبایش برخورد و نیامد: پێم گوت تۆزێ زوو بێ، دای لە گەنەی دەماخی و نەهات›.
**ترید** / tirîd, terîd/: اسم. تریت؛ تلیت؛ نان‌تێکوشە؛ نانەوڵا؛ نانی وڵیو لە چێشتاودا: **تلیت**
▣ ترید کردن: تریت‌کردن؛ وڵیوکردن؛ تێکوشین؛ وردەنان دەکاسەی چێشتاو کردن.
**تریش‌تریش** / tirîštirîš, terîšterîš/: صفت. ڕیشاڵ‌ـ ڕیشاڵ؛ تاڵ‌ـتاڵ؛ ونجڕ‌ـ ونجڕ؛ شیتاڵ؛ شڕ و شیتاڵ؛ تاڵۆراس؛ بە کەنارە پەراوێزی لێک پساوەوە ‹پارچه تریش‌ـ تریش شده بود: پارچەکە ڕیشاڵ‌ـ ڕیشاڵ بووە›.
**تریشه** / tirîše, terîše/ ☜ **تَراشه**
**تریشین** / tirîšîn, t(e)rîšîn، ـها/: [فرانسوی] اسم. تریشین؛ کرمی بەراز؛ جانەوەری ڕیخۆڵەی گوانداران (بەتایبەت بەراز و مرۆ).
**تریکو** / t(e)rîko/: [فرانسوی] اسم. تریکۆ: ۱. پارچەی کێشباف لە هەودای بادراوی یەک لۆ (هەورێشم، پەمو، خوری و هەودای دەستکرد) ۲. جلی کێشباف.
**تریکوباف** / t(e)rîkobāf، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] اسم. تریکۆچن: ۱. کەسێ کە لە کاری چنینی تریکۆدا شارەزایە ۲.

کەرەسەی تریکۆ چنین.

**تریکوبافی** / t(e)rîkobâfî/: [فرانسوی/فارسی]/اسم. تریکۆچنی: ١. کاری تریکۆ چنین ٢. /ـها/ کارگە یا دووکانی تریکۆ چنین ٣. کاری تریکۆچن.

**تریلر** / t(e)reyler/: [انگلیسی] ☜ **تریلی**

**تریلژی** / t(e)rîlojî، ـها/: اسم. سێبەشی؛ سێینە؛ ئاسەوارێک (وەک چیرۆک، شانۆنامە یان بەستەی مۆسیقا) بە سێ پاژی سەربەخۆ، بەلام بە ناوەرۆکێکی تاک و لە سەرجەمدا هاوبەشەوە.

**تریلی** / t(e)reylî، ـها/: [از انگلیسی]/اسم. ترەیلی: ١. بارهەلگر؛ گەلابە؛ کەرەسەی ڕاگوێزەر بۆ بار، کە بە ماشینێکەوە دەلکێت ٢. کامیۆنی بارهەلگر و باربەر * **تریلر**

**تریلیون** / terîl(i)yon, t(e)rîlyûn, trilyon، ـها/: [فرانسوی]/اسم. تریلیۆن؛ ملیۆنملیۆن (هەزار بلیوون= ١٠[١٢]): **ترلیون**

**ـ ترین** / tarîn/: پسوند. ـ ترین؛ ـ تەرین؛ هەری؛ هەرە؛ پاشوشەی ئاوەلناوی هەڤیازی ‹بدترین: خراپترین›.

**تری‌نیتروتولوئن** / t(e)rî-nîtrotolu'en/: [فرانسوی] ☜ **تی.اِن.تی**

**تز** / tez، ـها/: [فرانسوی]/اسم. تێز: ١. بڕوانامە؛ کۆتاییی‌نامە؛ نامە؛ نامیلکە ‹تز دکترایش در مورد جاندارن کویری بود: نامیلکەی دوکتوراکەی لەمەڕ گیاندارنی وشکارۆییەوە بوو› ٢. بیردۆز؛ بیرۆکە یان باوەڕێک لە بارەی شتێک یا دیاردەیەکەوە کە پێویستی بە لێدوان و لێکۆلینەوەیە ‹او دربارەی جامعەی ایران تز تازەای داشت: لەمەڕ کۆمەلگای ئێرانەوە بیردۆزێکی نوێی بوو› ٣. *[منطق]* سروشت؛ هێم؛ نەهاد.

**تزار** / tezâr، ـها/: [فرانسوی از اسلاوی]/اسم. *[قدیمی]* تیزار؛ قەیسەر؛ نازناوی ئیمپراتوورانی ڕووس.

**تزاریسم** / tezârîsm/: [فرانسوی]/اسم. تیزاریسم؛ دەزگا و ڕژێمی ڕامیاری و کۆمەلایەتی زال بە سەر ڕووسیەوە لە سەردەمی تیزاراندا.

**تزاید** / tazâyod/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ١. زۆری؛ پەرەگری؛ ڕەوتی پەرە سەندن؛ هەلدان؛ بەرز بوونەوە؛ هەلچوون؛ فرە بیەی ‹درآمد کشور روز بە روز در تزاید است: دەسهاتی ولات ڕۆژ بە ڕۆژ لە زۆر بووندایە› ٢. پێشڕەوت؛ پێشکەوت؛ ئەوزینە ‹همسایگان ما دائماً در ترقی و تزایدند و ما عقب افتادەایم: دراوسێکانمان هەمیشە لە پێشرەوت دان و ئێمە دوا کەوتووین›.

▣ **تزاید یافتن:** زۆر بوونەوە؛ زۆر بوون؛ فرە بوونەوە؛ زیاد بوونەوە ‹بە تدریج هوادارنش تزاید یافتند: وردە ــ وردە لایەنگرانی زۆر بوونەوە›.

**تزئین** / taz'în/: [عربی] ☜ **تزیین**

**تزئینات** / taz'înât/: [عربی] ☜ **تزیینات**

**تزئیناتی** / taz'înâtî/: [عربی] ☜ **تزییناتی**

**تزئینی** / taz'înî/: [عربی] ☜ **تزیینی**

**تزریق** / tazrîq، ـها؛ ـات/: [از عربی]/اسم. ١. *[پزشکی]* کار یان ڕەوتی دەرزی وەشاندن؛ شانەی؛ تێڕۆکردنی دەرزی دە لەشی کەس (یان گیاندارێک) بە هۆی لێدانی شرینقەوە ‹روزی یک آمپول تزریق کنید: ڕۆژێ دەرزیەک بوەشێنن› ٢. کار یان ڕەوتی شتێ کردنە ناو شتێکیترەوە بە مەبەستی بووژاندنەوە و هێز پێدانیەوە ‹تزریق سیمان: تێشاندنی سیمان›.

▣ **تزریق آمپول:** دەرزی وەشاندن؛ چەنشەی. هەروەها: **تزریق سِرُم؛ تزریق خون؛ تزریق واکسن**

تزریق پلاستیک: تێشاندنی پلاستیک.

تزریق زیرجلدی: وەشاندنی ژێر پێستی.
هەروەها: **تزریق عضلانی؛ تزریق وریدی**

▣ **تزریق‌شدن**: ۱. *[پزشکی]* دەرزی وەشیان ۲. *[مجازی]* برانە مێشکەوە؛ خرانە مێشکەوە ‹به او تزریق شده بود که آن‌طور بگوید: برابوود میشکیەوە کە وا بێژێ›.
هەروەها: **تزریق کردن**

**تزریقات** / tazrîqāt/: [از عربی] *اسم.* *[گفتاری]* تەزریقات؛ هۆدە، بەخش یان دامەزراوەی تایبەتی بۆ دەرزی وەشاندن.

**تزریقاتچی** / tazrîqātčî، ـها؛ ـان/: [از عربی/ ترکی] *اسم.* *[گفتاری]* دەرزی‌وەشێن؛ چەن‌شان.

**تزریقاتی** / tazrîqātî، ـها/: [از عربی] *اسم.* تەزریقاتی: ۱. شوێنێ کە دەرزی تێدا دەوەشێنن ۲. دەرزی وەشێن؛ چەن شانەی ‹همسایەی ما تزریقاتی است: دراوسێکەمان دەرزی وەشێنە›.

**تزریقی** / tazrîqî/: [از عربی] *صفت.* ۱. وەشێنی؛ شیاو بۆ وەشاندن ۲. وەشێنراو؛ وەشراو.

**تزکیه** / tazkiye/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* کار یان ڕەوتی پاکژکردنەوە؛ سڕینەوە؛ پاک کردنەوەی دڵ و دەروون و لابردنی هزر و ڕەوشتی پیس و نارەوا ‹تزکیه درون: پاکژ کردنەوەی دەروون›.

**تزلزل** / tazalzol/: [عربی] *اسم.* ۱. خۆنەگرتوویی؛ خۆنەگری؛ سستی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لە دەست دانی پتەوی و ڕاوەستاوی ۲. *[مجازی]* دۆخ یان چۆنیەتی شلەژان؛ پەشۆکان؛ پەشێو بوون؛ شێوان ‹تزلزل و هراس در دل او راه ندارد: شلەژان و هەراسی لێ نانیشێ›.

**تزلزل‌ناپذیر** / tazalzolnāpazîr/: [عربی/ فارسی] *صفت.* قورس‌وقایم؛ خۆڕاگر؛ پێ‌پەیت؛ پتەو ‹ارادەی تزلزل‌ناپذیر: ویستی قورس‌وقایم›.

**تزویج** / tazvîc/: [عربی] *اسم.* کار یان ڕەوتی بە شوو دان یان ژن هێنان.

**تزویر** / tazvîr، ـها/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* دووڕوویی؛ مەرایی: ۱. زمانلووسی؛ ڕواڵەتکاری و ڕیاکاری بە مەبەستی فریو دانی خەڵک ‹در میخانه ببستند خدایا مپسند/ که در خانەی تزویر و ریا بگشایند: دەری مەیخانەیان داخست خودایا خۆت هەڵینەگری/ کە دەرکی ماڵی دووڕوویی و ڕیاکاری ئەوالا کەن› ۲. گزی؛ فێڵ؛ دەبە؛ خاپینۆکی ‹رفتار او همه تزویر بود: هەموو ئاکاری مەرایی بوو›.

▣ **تزویر کردن**: دووزمانبازی (کردن)؛ دووڕوویی کردن ‹چون نیک بنگری همه تزویر می‌کنند: ئەگەر باش چاوی لێ کەی گش خەریکی دووزمانی دەبن›.

**تزیید** / tazyîd/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* زێدەیی؛ زۆری؛ فرەیی؛ ئەوزەنە ‹خبر موفقیت شما موجب تزیید مسرت گردید: هەواڵی سەرکەوتنتان بوو بە هۆی زێدەیی شادیمان›.

**تزیین** / tazyîn، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* کاری ڕازاندن؛ خەملاندن؛ نەخشاندن؛ تەوزاندن؛ نتلاندن: **تزئین**

▣ **تزیین کردن**: ڕازاندنەوە؛ خەملاندنەوە؛ نەخشاندنەوە؛ ئاڕایشتکردن؛ خوشیک کردن ‹بچەها مدرسە را تزیین کردند: منداڵەکان قوتابخانەکەیان ڕازاندەوە›.

**تزیینات** / tazyînāt/: [عربی] *اسم.* ۱. جوانکاری ‹تزیینات اینجا به عهدەی بچەهاست: جوانکاری ئێرە بە ئەستۆی منداڵانە› ۲. ساچ و پەرچەم؛ گیز و گوڵەنگ ‹تزیینات زیادی را به در و دیوار آویخته بودند: ساچ و پەرچەمی زۆریان بە دەر و دیوارەوە هەڵواسیبوو› ❋ **تزئینات**

**تزییناتی** / tazyînātî ـ‌ها/: [عربی]/اسم. دامەزراوە یان کەسێ کە کاری ئامادە کردن و فرۆشتنی شتومەکە بۆ ڕازاندنەوەی ناومال (وەک پەردە، کاغەز دیواری و...): **تزئیناتی**

**تزیینی** / tazyînî/: [عربی] صفت. ئاڕایشتی؛ ڕازاندنەوەیی؛ پێوەندیدار بە ڕازاندنەوەوە ‹گل تزیینی: گولی ئاڕایشتی›: **تزئینی**

**تسامح** / tasāmoh ـ‌ات/: [عربی]/اسم. ١. [نامتداول] کەمتەرخەمی؛ سستی؛ شلی؛ شەویقی ٢. چاوپۆشی؛ لێنەگری؛ لێبوردوویی؛ کار یان ڕەوتی زۆر سەرنج نەدان و بە دوادا نەچوون و سەنگ و سۆزن نەکردنی کارێک ‹در اینجا باید تسامح داشت: لێرەدا دەبێ چاوپۆشی بکرێ›.

**تساوی** / tasāvî ـ‌ها/: [عربی]/اسم. [ادبی] یەکسانی؛ بەرامبەری؛ بەرانبەری؛ بەرابەری؛ هەمبەری؛ وەکیەکی ‹تساوی حقوق زن و مرد: یەکسانی مافی ژن و مێرد›.

**تساهل** / tasāhol ـ‌ها/: [عربی]/اسم. [ادبی] ١. [نامتداول] هاسانگری؛ ئاسانگری؛ ساناکاری؛ کار یان ڕەوتی هێساندن ٢. پشوودرێژی؛ نیانی؛ نەرمی‌نوێنی؛ خۆڕاگری لە بەرامبەر بیر و ڕای پێچەوانەوە ‹تساهل از ضرورتهای جامعه است: پشوودرێژی لە پێداویستیگەلی کۆمەلگایە›.

**تسبیح** / tasbîh ـ‌ها/: [عربی]/اسم. ١. تەزبێح؛ دەسحێب؛ تەزبی؛ تزبێ؛ تزبی؛ تەزبیێ؛ زەرزەنگ؛ لیزگە مووروو ڕیزکراو ٢. ـ‌ات/[ادبی] نزا؛ گازە؛ ستایشت؛ ڕەوش؛ کار یان ڕەوتی پەسن‌کردن؛ پەسن‌دان ‹او هر صبح مشغول تسبیح بود: هەموو بەیانیەک خەریکی نزا بوو›.

▣ **تسبیح انداختن**: تەزبێح داخستن؛ تەزوێحان‌کردن.

**تست** / test ـ‌ها/: [انگلیسی]/اسم. تیست: ١. کار یان ڕەوتی هەلسەنگاندن؛ تاقی کردنەوە ‹تست هوش: هەلسەنگاندنی هۆش› ٢. ئەزموون؛ هیچ؛ کۆمەلێک پرسیار بۆ تاقی‌کردنەوەی زانست، هۆش یان توانایی ‹تست هنر: ئەزموونی هونەر› ٣. ئەزموون؛ کار و کردەوەیەک بە مەبەستی ناسین و ڕوون کردنەوەی شتێک بە پاژگەلیەوە ٤. تاقی؛ هێچ؛ کار یا ڕەوتی هەلسەنگاندن بە ئەزموون ‹این دارو هنوز تست نشده است: ئەم دەوایە هێشتا تاقی نەکراوەتەوە›. هەروەها: **تست شدن؛ تست کردن**

▣ **تست هوش**: آزمون هوش ☜ **آزمون**

**تست** / tost/: [انگلیسی] صفت. بڕژاو؛ برژیاگ؛ برێژیاو؛ برێژیا؛ برێشتە ‹نان تست: نانی برژاو›.

▣ **تست شدن**: بڕژان؛ برژیان؛ برێژیەی؛ برشتە بوون ‹نان خوب تست نشده: نانەکە باش نەبرژاوە›. هەروەها: **تست کردن**

**تستر** / toster ـ‌ها/: [انگلیسی]/اسم. برژێنە؛ کەرەسەیەکی زۆرتر کارەبایی بۆ گەرم کردنەوە یا برژاندنی نان.

**تستوسترون** / testosteron/: [فرانسوی]/اسم. [فیزیولوژی] تیستوسترۆن؛ هورمۆنی نێرینەیی؛ ماکی تایبەتی جنسی نێر و هۆی هەلدانەوەی تایبەتمەندیگەلی نێرینەیی.

**تستی** / testî/: [انگلیسی] صفت. تیستی؛ بە شێوەی تیست؛ پرسیارێ کە وەرامەکەی وشەیێک یان دوو وشە بێ.

**تسجیل** / tascîl/: [عربی]/اسم. مسۆگەر؛ کار یان ڕەوتی چەسپان؛ پەسند بوون ‹استخدام تو تسجیل می‌شود: دامەزراویت مسۆگەر دەبێت›.

**تسخیر** / tasxîr/: [عربی]/اسم. داگیرکاری؛

کار یا ڕەوتی داگرتن و دەست بە سەردا ڕاگرتن؛ فرستقاندن ‹تسخیر شهر: داگیرکاری شار›.

⊡ تسخیر ارواح: داگیرکاری ڕۆح؛ کار و ڕەوتی (بە ڕواڵەت) ڕۆحی دیتران گوێڕایەڵی خۆکردن.

**تسخیری** / tasxîrî/: [عربی] ☜ وکیل تسخیری، **وکیل**

**تسری** / tasarrî/: [عربی]/اسم. [ادبی] ئاژۆ؛ کار یان ڕەوتی دزەکردن؛ ڕێبردن؛ تەنینەوە؛ تەشەنەکردن؛ ئەوەتەنەی؛ تەنایەوە ‹این قانون بعداً به موردهای دیگر هم تسری یافت: ئەم قانوونە لە دواجاردا درەی کردە ناو بابەتەکانی‌ترەوە›.

**تسریع** / tasrî'/: [عربی]/اسم. [ادبی] خێراکاری؛ بلەزکری؛ کار یان ڕەوتی خێرایی پێدان و بە پەلە خستن.

**تسطیح** / tastîh/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی تەختکردن؛ سافکردن؛ هەموار کردن؛ پانەوەکەردەی ‹جاده شن‌ریزی و تسطیح شد: ڕێگاکە زیخی ڕژرا و تەخت کرا›.

**تسعیر** / tas'îr/: [عربی]/اسم. [گفتاری] کار یان ڕەوتی نرخاندن؛ نرخ برین؛ نرخ برینەوە؛ نرخ دەرهێنان؛ نرخ دانان.

⊡ تسعیر کردن: پارەگۆڕینەوە؛ پووڵەوە وارەی؛ پارەی وڵاتێک گۆڕینەوە و بە هی وڵاتێکی‌تر.

**تسکین** / taskîn/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی دامرکان؛ داسەکان؛ سرەویان؛ سرەوان؛ سرەوەی؛ ئارام بوونەوە بە هۆی نەمانی ئێش و ئازارەوە ‹آمپولی که زدم باعث تسکین دردم شد: ئەو دەرزیەی کە وەشاندم بووە هۆی دامرکانی ئێشەکەم›.

⊡ تسکین درد: ئێش دامرکیان؛ ئێش سرەویان.

⊡ تسکین دادن: دامرکاندن؛ سرەواندن؛ داسرەکاندن؛ داسەکنان؛ سرەونەی؛ هەدا دان.

تسکین یافتن: سرەوان؛ سرەویان؛ سرەوتن؛ دامرکان؛ داسرەکان؛ داسەکان؛ سرەویەی ‹با خوردن آن دارو، دردم تسکین یافت: ئەودەرمانەم کە خوارد، ئێشەکەم سرەوی›.

تسلا / tasallā/: [عربی] ☜ **تَسَلّی**

**تسلسل** / tasalsol، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] زنجیرە؛ پەیوەستەیی؛ گەواڵە؛ گەلوازە؛ ڕەوتی یەک لە دوای یەک بوون.

**تسلط** / tasallot/: [عربی]/اسم. [ادبی] زاڵێتی؛ زاڵی؛ چێری: ١. دەستەلات؛ دەسەلات؛ دەسچووگی؛ بالادەستی ٢. کارامەیی؛ لێهاتوویی ‹تسلط او بر این کار موجب موفقیتش شد: زاڵیی بە سەر ئەم کارەدا بووە هۆی سەرکەوتنی›.

⊡ تسلط یافتن: دەسەلات پەیداکردن؛ چێر بوون؛ زاڵ بوون: **تحت تسلط درآوردن**

تحت تسلط درآوردن ☜ **تسلط یافتن**

**تسلی** / tasallî، ـات/: [عربی]/اسم. سوکنایی؛ خەمڕەوێنی؛ هەداری؛ ڕزگاری لە خەم و پەژارە: **تسلا**

⊡ تسلی دادن: سوکنایی پێدان؛ داسەکنین؛ هەدنانـدن؛ دڵخۆش‌کردن ‹آمدن پسرش او را تسلی داد: هاتنەوەی کوڕەکەی سوکنایی بەدا›.

تسلی یافتن: سوکنایی هاتن؛ سا خستن؛ لە خەم و پەژارە ڕزگار بوون.

**تسلی‌بخش** / tasallîbaxš/: [عربی/فارسی] صفت. سوکنایی‌دەر؛ هێوری‌دەر؛ خەمڕەوێن؛ سرەوێنەر؛ وەروێڕکە ‹رفتار مهربانت تسلی‌بخش او شد: ئاکاری پڕ لە خۆشەویستیت سوکنایی‌دەری ئەو بوو›.

**تسلیت** / tasliyat/، ھـا/: [عربی]/اسم. ١. دڵنوایی؛ کار یان ڕەوتی دڵدانەوە؛ دڵخۆشی دانەوە؛ سەرەخۆشی کردن؛ هاودەردی کردن لەگەڵ کەسێکدا کە خەمبارە، بەتایبەت کەسێک کە لە چەم و خەمی لە دەست دانی کەسێکی ئازیز دایە ٢. سەرەخۆشی؛ سەرسلامەتی.

▣ **تسلیت دادن**: دڵخۆشی دانەوە؛ دڵنوایی کردن؛ دڵوەشی دایوە ‹دوستانم می‌آمدند و من را تسلیت می‌دادند: هەڤالانم دەهاتن و دڵخۆشیان دەدامەوە›.

**تسلیت گفتن**: سەرەخۆشی کردن؛ دڵدانەوە؛ سەرسلامەتی (لێ) کردن ‹او به خانوادەی کشته شدگان تسلیت گفت: لە بنەماڵەی کوژراوان سەرەخۆشی کرد›.

**تسلیح** / taslîh/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی چەکدارکردن؛ چەک پێدان؛ پڕچەک کردن ‹تسلیح گروههای سیاسی: چەکدارکردنی کۆمەڵە سیاسیەکان›.

**تسلیحات** / taslîhāt/: [عربی]/اسم. چەک و چۆڵ؛ ئامرازی شەڕ ‹تسلیحات شیمیایی: چەک و چۆڵی کیمیاوی›.

**تسلیحاتی** / taslîhātî/: [عربی] صفت. چەک و چۆڵی؛ پێوەندیدار بە چەک و چۆڵەوە ‹مسابقەی تسلیحاتی: کێبەرکێی چەک و چۆڵی›.

**تسلیم**[1] / taslîm/: [عربی]/اسم. ١. بەیدەست؛ بەیدەس؛ ڕەوتی خۆ بە دەستەوە دان ‹تسلیم آلمان در سال ١٩۴۵ به جنگ خاتمه داد: بەدەستدانی ئاڵمان لە ساڵی ١٩٤٥دا کۆتایی بە شەڕ هێنا› ٢. *[مجازی]* کار یان ڕەوتی چۆکدان؛ کۆڵدان ‹تسلیم در برابر خواست همسرش به ضرر اوست: چۆکدان لە هەمبەر ویستی هاوسەریەوە بە زەرەریەتی› ٣. *[ادبی]* کار یان ڕەوتی دانەدەس؛ وەدان؛ خستنە دەس؛ پێدان ‹تسلیم پول به او اشتباه بود: پارە دانە دەستی ئەو هەڵە بوو› ٤. *[تصوف]* ڕازی بوون بەوەی لە لایەن خوداوە دێت و خۆ بەیدەستکردن لە بەرانبەریدا.

**تسلیم**[2]: *صفت.* بەیدەست؛ بەیدەس؛ فەرمانبەر.

**تسمه** / tasme/، ھـا/: [ترکی]/اسم. سیرم؛ سیرمە؛ سریمە؛ نەوارێک لە چەرم، قاییش، کەژ، کانزا یان ماکێکی پتەو بۆ: الف) بەستن و شەتەکدان ب) گەیاندنی هێزی موتور بە بەشگەلی تری کەرەستە.

▣ **تسمه از گردەی کسی کشیدن**: *[کنایی]* بەرد بە کەسێ کێشان؛ قوڕەکاری بە کەسێ کردن؛ کەسێ کێش هاوردن؛ زەنگەنارە بە یۆی کەردەی؛ هەڵپێچاندنی کەسێک بە کارگەلێکی دژوارەوە ‹او را ببر پیش خودت و مدتی تسمه از گردەاش بکش بلکه آدم شود: بیبە لای خۆت و ماوەیەک بەردی پێ بکێشە بەڵکوو ببێتە پیاو›.

**تسمه‌پروانه** / tasmeparvāne/، ھـا/: [ترکی/فارسی]/اسم. سیرمێک کە پەروانەی موتور دێنێتە سووڕان بۆ فێنک کردنەوەی.

**تسمه‌نقاله** / tasmenaqqāle/، ھـا/: [ترکی/عربی]/اسم. ئامێرێک بۆ ڕاگوێزانی یەک لە دووی یەکی شتومەکی چکۆلە یان گەورە لە ڕێگەیەکی کورتدا (وەک ئەم لاو ئەو لای کارگایە یان نهۆمی ماڵێک) بە هۆی گەڕانی قایش یان زنجیر و نەوارێکەوە.

**تسمیه** / tasmiye/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کار یان ڕەوتی ناو لێنان؛ ناو پێوەنان؛ ناو نیان؛ ناو نان؛ نامێ نیەی/ نیای ‹علت تسمیه آنجا به ایسلند وجود برف و یخ دائم است: هۆی ناونانی ئەوێ بە ئایسلەند بوونی بەفر و بەستەڵەکی هەمیشەییە›.

**تسنن** / tasannon/: [عربی]/اسم. سوونە؛

سوننی؛ ناوی گشتی ڕێبازگەلی ئیسلامی کە شوێنکەوتوانی، خۆیان بە پەیڕەوی پەیغەمەری ئیسلام و داب و دەستووری ئەو دەزانن.

**تسویه** / tasviye/: [عربی]/سم. کار یان ڕەوتی یەکلاکردنەوە؛ جیاکردنەوە؛ تەخت کردن؛ پاککردنەوە؛ ڕێککردن؛ یەکسان کردن: **تسویه حساب**

◙ تسویه حساب ☜ **تسویه**

**تسهیل** / tashîl، ـات/: [عربی]/سم. ساناکاری؛ ئاسانکاری؛ کار یان ڕەوتی ئاسانکردنەوە و سووککردنەوە ‹برای تسهیل کار ارباب‌رجوع: بۆ ئاسانکاری ئیشی کارهێنەران›.

**تسهیلات** / tashîlāt/: [عربی]/سم. ساناکاری؛ ئاسانکاریگەل؛ کار و پێشبینیگەلێ کە بۆ سووک و ئاسانترکردنی کار ڕەچاو دەکرێ ‹تسهیلات بانکی: ساناکاری بانکی›.

**تسهیم** / tashîm/: [عربی]/سم. بەشبەندی؛ کار یان ڕەوتی دابەشین؛ دابەشینەوە؛ بەش ـ بەشکردن؛ بەشکردنەوە؛ بەشەوە کەردەی.

◙ تسهیم بە نسبت: بەش بە گوێرەی سەرمایە.

**تشابه** / tašāboh، ـات/: [عربی]/سم. لێکچوویی؛ وێکچوویی؛ هاوشێوەیی؛ وەکهەڤی؛ هاووێنەیی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی لێککردن؛ وەک یەک بوون؛ لە یەک چوون؛ وێکچوون؛ مانایش؛ جە یۆ شیەی ‹تشابه آن دو حیرت‌انگیز بود: وێکچوویی ئەو دووانە سەرسووڕێن بوو›.

**تشبث** / tašabbos، ـها؛ ـات/: [عربی]/سم. چنگ‌هاوێژی؛ چنگ‌ئاوشی؛ کار یان ڕەوتی دەسگرۆ دۆزینەوە.

◙ تشبث کردن: چنگاوش بوون؛ کردنە بیانوو؛ بیانوو بۆ هێنانەوە؛ کەسێ یان شتێ‌کردنە ئامرازی دەست بۆ گەیشتن بە ئامانجێک.

**تشبه** / tašabboh/: [عربی]/سم. کەفتدۆزی؛ کار یان ڕەوتی وەکهەڤی دۆزینەوە؛ هاوشێوەیی دۆزینەوە.

◙ تشبه جستن: خۆ وا نواندن؛ خۆ چواندن؛ خۆ وەکوو کەسێ یان شتێک دەرهێنان.

**تشبیب** / tašbîb/: [عربی]/سم. /ادبی/ شیعر و هۆنراوەیەک کە باسی ئەوین و سەردەمی لاوی و سروشت بکا.

**تشبیه** / tašbîh، ـها؛ ـات/: [عربی]/سم. کار و ڕەوتی شوبهاندن؛ چواندنی کەسێ یان شتێک بە کەس یان شتانی‌تر کە لە بڕێک تایبەتمەندیدا وەک یەکن.

◙ تشبیه کردن: شوبهاندن؛ چواندن ‹حافظ ماه نو را به داس تشبیه کرده است: حافز مانگی نوێی بە داس چواندووە›.

**تشت** / tašt، ـها/: /سم. تەشت؛ سوێنە؛ ڕەمە؛ دۆل؛ دەولە؛ دۆلە؛ دەفری گەورەی بن‌تەختی لێوار تەسک (زیاتر) بۆ شۆردنی جل‌وبەرگ: **طشت**

◙ تشت کسی از بام افتادن: /مجازی/ ناوی کەسێ زڕیان؛ قالی کەسێک دەرچوون؛ قاوی کەسێک داکەوتن؛ ئابڕووی کەسێک چوون.

**تشتت** / tašattot/: [عربی]/سم. /ادبی/ بلاوی؛ پرژ و بلاوی: ١. ناکۆکی ‹تشتت آرا: ناکۆکی را› ٢. بێ‌سەرە و بەرەیی؛ پەرشاوی ‹تشتت فکر: بلاوی بیر›.

**تشتک** / taštak، ـها/: /سم. ١. تەشتەک؛ سەرەبوتری؛ پارچەیەکی پەلاسیتکی یان کانزایەکی چکۆلەی لچ هەلگەڕاوی ددانەدار، بۆ بەستنی سەری شووشە ٢. تەشتیلکە؛ تەشتەکلە؛ سەعەند؛ سەحەند؛ سەحنچە؛ ئەستونکە؛ تەشتی چکۆلە؛

تەشتێ کە لە ئازمایشگا یان لە کارگەگەلی تایبەتیدا بۆ کاری کیمیاوی (وەک وێنە ڕوون‌کردنەوە یان تۆماری فیلم) بەکار دێ ❊ طشتک

**تشجیع** / tašcî'/: [عربی]/اسم. دنە؛ هانە؛ هانە ـ هانە؛ هانی؛ ناوکێ؛ زیخ؛ زاخ؛ کار یان ڕەوتی زیخ‌کردن بە قسە؛ هاندان؛ هێزان؛ گالدان؛ دەست لە پشت دان؛ تیژکردن؛ هۆرنیەی؛ هەڵخڕاندن ‹زنش هم مرتب او را تشجیع می‌کرد: ژنەکەشی هەر لە پەستا دنەی دەدا›.

**تشخص** / tašaxxos، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ۱. گەورەیی؛ بەرچاوگری؛ مەزنی؛ مەزناهی؛ گرنگی کەسایەتی ۲. بڕشت؛ ڕێز؛ بڕ ‹بزرگی و تشخص خود را یکباره از دست داد: گەورەیی و ڕێزی خۆی بە جارێک لە دەستدا›.

⊡ تشخص به خرج دادن: گەورەیی نواندن؛ مل‌گرتن؛ خۆ نواندن؛ فیزکردن: **تشخص فروختن**

تشخص فروختن ☜ **تشخص به خرج دادن**

**تشخیص** / tašxîs، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. کار یان ڕەوتی ناسینەوە؛ دەست‌نیشان‌کردن؛ دیاری‌کردن؛ تەڵنیشان‌کردن؛ ڤەناسین؛ پێزانین؛ ئەوەژناسەی؛ ژناسایوە؛ ڤەناسینی شتێک لە نێوان دوو یان چەند شتدا بە ڕوانین لە تایبەتمەندیگەلیان ‹تشخیص خوب و بد این کار به عهده‌ی شماست: دەست‌نیشان‌کردنی چاک یان خراپی ئەم کارە بە ئەستۆی ئێوەیە› ۲. *[ادبیات]* کەسایەتی مرۆڤانە بە شتان و گیانلەبەران دان و وەک مرۆڤ پیشاندانیان.

⊡ تشخیص پزشکی: ناسینەوەی نەخۆشی یان گرفت لە ڕووی نیشانەکانیەوە.

تشخیص هویت: *[حقوق]* ۱. ناسینەوەی کەسی گومان لێکراو (بە پێی شوێنی ئەنگوست، D.N.A ، وێنەهەڵگری و...) ۲. پێشینەناسی.

⊡ تشخیص دادن: پێزانین؛ ناسینەوە؛ دیاری‌کردن؛ تەڵنیشان‌کردن؛ دەست نیشان‌کردن؛ ژناسایەوە ‹بیماری مرا تشخیص نداد: نەخۆشیەکەی منیان پی نەزانی›.

**تشخیص‌کار** / tašxîskār، ـها؛ ـان/: [عربی/فارسی]/اسم. کارلێزان؛ کەسێ کە کاری دۆزینەوە و پێزانینی شوێنی تەرەکاو و خەوش هەڵگرتووی لوولەیە.

**تشدد** / tašaddod/: [عربی]/اسم. تووڕەیی؛ توندی ‹عزیزم! پول خواستن که دعوا و تشدد نمی‌خواهد: کەسەکەم! پارە ویستن خۆ شەڕ و تووڕەیی ناوێ›.

**تشدید** / tašdîd/: [عربی]/اسم. ۱. پەرەگری؛ پەرەسێنی؛ تەشەنەکری؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەخت‌تر، توندتر یان بەهێزتر بوونی ڕەوتێک؛ زۆرتر بوون؛ فرەتەر بیەی ‹تشدید بیماری آرام را افسرده کرده: پەرەگری نەخۆشیەکە، ئارامی کزکردووە› ۲. /ـها/ گیرە؛ دووپات؛ نیشانەیەک لە ڕێنووسی عارەبی و فارسیدا بە شێوەی «ّ» کە لە سەر هەر پیتێک دابنرێ ئەو پیتە دووجار دەخوێندرێتەوە (لە کۆتایی بڕگەیەک و سەرەتای بڕگەیەکی تری وشەدا).

**تشدیدگر** / tašdîdgar، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. زۆرەوەکەر؛ زۆرکەرەوە.

**تشر** / tašar، ـها/: اسم. *[گفتاری]* تەشەر؛ تەشەرە؛ تانە؛ تانووت؛ توانج؛ تەوس؛ لاتاو؛ تۆپ؛ خوڕ؛ پلار؛ قسەی تاڵ و ناخۆش سەبارەت بە کەسێک.

⊡ تشر زدن: تانە لێدان؛ تەشەر لێدان؛ پلار تێ گرتن؛ تەوسان؛ قەرفین؛ تیژکردن؛

پووپین ‹به من تشر زد که چرا گذاشتی برود: تانەی لێدام، کە بۆچی هێشتت بڕوا›.

**تشرف** / tašarrof/: [عربی]/اسم. سەرفیرازی؛ بەختەوەری؛ ڕەوتی شەرەف پێبڕان ‹تشرف به دین اسلام: سەرفیرازی بە دینی ئیسلام›.

▣ **تشرف پیدا کردن**: خزمەت چوون؛ چوونە خزمەت؛ ڕۆیشتنە خزمەت کەسێکی خاوەن دەسەلات یان پیاو چاکێک یا شوێنێکی پیرۆز: **تشرف یافتن**

**تشرف یافتن** ☜ **تشرف پیدا کردن**

**تشریح** / tašrîh، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. شرۆڤەکاری؛ کوڵکومووش؛ کار یان ڕەوتی شیکردنەوە و لێدوان لە چۆناوچۆنی شتێک یان ڕووداوێک بە وتنەوەی وردەکاریەکانیەوە ‹آزاد ماجرا را تشریح کرد: ئازاد ڕووداوەکەی شیکردەوە› ٢. *[قدیمی]* توێکاری؛ کار یان ڕەوتی تەرم دیتنەوە ٣. لەشکاوی؛ تەرم پشکنین ‹درس تشریح داشتم: وانەی توێکاریم هەبوو›.

▣ **تشریح کردن**: ١. شیکردنەوە؛ لێکدانەوە؛ وتنی وردەکاریگەلی بابەتێک ٢. توێکاری کردن؛ لەش کاوین؛ تەرم پشکنین.

**تشریحی** / tašrîhî/: [عربی] صفت. شرۆڤەکارانە؛ شیکراوەیی ‹جوابهای تشریحی: وەڵامگەلی شرۆڤەکارانە›.

**تشریع** / tašrî'/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی دەستوور دانان؛ دین داهێنان.

**تشریف** / tašrîf، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. سەرفیرازی؛ بەختەوەری؛ ئەوەی کە دەبێتە هۆی ڕێز و ئابڕوو ‹هر صوفی که نو رسیدی، تشریف وی آن بودی که شب نخستین با شیخ هم کاسه بودی: هەر سۆفییەک کە تازە دەگەیشت، سەرفیرازی ئەوە بوو کە شەوی یەکەم هاوبەشی شێخ بێ› ٢. *[قدیمی]* خەڵات؛ دیاری.

▣ **تشریف آوردن**: هاتن؛ ئامەی؛ تەشریف هێنان ‹آقای رئیس تشریف آوردند: بەڕێز سەرۆک هات›.

**تشریف بردن**: ڕۆیشتن؛ چوون؛ لوەی؛ لوای؛ تەشریف بردن ‹چرا به این زودی تشریف می‌برید؟: بۆچی بەم زووە دەڕوونەوە؟›.

**تشریف داشتن**: هەبوون؛ بوون؛ بیەی ‹آقا تشریف دارند؟: ئاغە هەیە؟›.

**تشریفات** / tašrîfāt/: [عربی]/اسم. ڕەسم و یاسا؛ داب و دەستوور؛ ڕێ و شوێن؛ نەریتگەلی وەرگیراو لە لایەن دەزگایێکەوە بۆ ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو ‹تشریفات اداری: ڕەسم و یاسای مەزرینگەیی›.

**تشریفاتی** / tašrîfātî/: [عربی] صفت. ١. پڕ زەرق و بەرق ‹مراسم تشریفاتی: دام و دەستووری پڕ زەرق و بەرق› ٢. *[مجازی]* ڕوالەتی؛ بێناوەرۆک ‹کارهای تشریفاتی: کارگەلی ڕوالەتی›.

**تشریف‌فرمایی** / tašrîf.farmāyî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[ادبی]* چوونی کەسێکی بەڕێز بۆ شوێنێک.

**تشریک‌مساعی** / tašrîkemasā'î، ـها/: [عربی]/اسم. ئاریکاری؛ هاوکاری؛ بەشداری ‹مردم در ساختن مدرسه با دولت تشریک مساعی کردند: خەڵکی بۆ درووس کردنی قوتابخانە، لە گەڵ دەوڵەتدا ئاریکاریان کرد›.

**تشرین** / tešrîn/: [عربی]/اسم. تەشرین؛ تشرین؛ ناوی دوو مانگ لە مانگەکانی ساڵی هەتاوی لە وڵاتە عەرەبیەکاندا، نێوان ئەیلوول و کانوونی یەکەم.

▣ **تشرین اول**: تەشرینی یەکەم؛ مانگی دەهەم، بەرانبەر بە ئۆکتوبر، ٣١ ڕۆژە، لە ٩ی ڕەزبەرەوە تا ٩ی گەڵاڕێزان.

**تشرین ثانی**: تەشرینی دووهەم؛ مانگی

یازدەهەم، بەرامبەر بە مانگی نوامبر، ٣٠ ڕۆژە، لە ١٠ی گەلاڕێزانەوە تا ٩ی سەرماوەز.

**تشعشع** / tašaʹšoʹ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. پرزەپرژانی؛ پریشکەپژێنی؛ پرشەوەشێنی ٢. [فیزیک] تیشکپژێنی؛ کار یان ڕەوتی درەوشانەوە؛ تیشکدانەوە.

**تشعیر** / tašʹîr، ـات/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی ڕازاندنەوەی پەراوێزی کتێب یان نووسراوە بە وێنەی گیا و گیانلەبەران.

**تشفی** / tašaffî/: [عربی]/اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی خۆش بوونەوە؛ خوەشەو بوون؛ چاک بوونەوە؛ ساغ بوونەوە؛ وەشەوە بیەی؛ باش بوونەوە.

▣ تشفی یافتن: خۆش بوونەوە؛ چاک بوونەوە؛ ساغ بوونەوە.

**تشک** / tošak، ـها/: [ترکی]/اسم. ١. دۆشەک؛ دۆشەکە؛ دۆشک؛ دۆشەگ؛ تۆشەک؛ جۆشەک؛ نالی؛ نالیک؛ ناهیلک؛ نوهیلک؛ ڕۆنیشتەک؛ متێل؛ مرتێل؛ ژێر ڕایەخی ناوتێخراو ٢. جێی دانیشتن لە سەر کورسی و کەنەپە، کە زۆرتر لە شتێکی نەرم چێکراوە * **توشک؛ دوشک؛ دشک**

▣ تشک برقی: دۆشەکەی کارەبایی؛ دۆشەکێک کە بە هێزی کارەبا گەرم دەبێ. هەروەها: **تشکچەی برقی**

تشک خوشخواب: دۆشەک فەنەری؛ ناوی بازرگانی دۆشەکەی فەنەری.

تشک فنری: دۆشەک فەنەری؛ تۆشەکێ کە فەنەری نەرمی تێنراوە.

تشک کشتی: دۆشەکی زۆرەبانێ؛ دۆشەکەیێکی گەورەی چوارگۆشە کە زۆرانی لە سەر دەگرن.

**تشکچه** / tošakče، ـها/: [ترکی/ فارسی]/اسم. نالیچە؛ دۆشەکۆڵە؛ نمدەر؛ دۆشەکچە؛ دۆشەکەڵە؛ ژێرخەرێکی چکۆلەی چوارگۆشەیە کە لە ماکێکی نەرم چێکراوە و بە بەرگێکی ناسک داپۆشراوە: **دشکچه**

**تشکر** / tašakkor، ـات/: [عربی]/اسم. سپاس؛ سوپاس ‹از همەی دوستان تشکر می‌کنم: سپاسی هەموو دۆستان دەکەم›.

**تشکرآمیز** / tašakkorāmîz/: [عربی/ فارسی] صفت. بە سپاسەوە؛ سپاسمەندانە؛ تێکەڵاوی سپاس و پێزانین ‹نامەی تشکرآمیز: نامەی بە سپاسەوە›.

**تشکرنامه** / tašakkornāme، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. سپاسنامە؛ نامەی تایبەت بۆ بەجێهێنانی سپاس و پێزانین.

**تشکل** / tašakkol/: [عربی]/اسم. پێکهاتە: ١. [نامتداول] کار یان ڕەوتی پێکهاتن؛ خۆگرتن ٢. ڕەوتی کۆڕ بەستن (بەتایبەت لە دامەزراوەیەکدا) ‹برای تشکل دانشجویان تلاش می‌کنند: بۆ پێکهاتەی خوێندکاران تێدەکۆشێ› ٣. ـها؛ ـات/ دامەزراوە؛ ڕێخراوە ‹تشکل‌های سیاسی: پێکهاتەگەلی ڕامیاری›.

**تشکیک** / taškîk/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی دوودڵ کردن؛ دردۆنگ کردن؛ دوودڵی خۆش کردن؛ وە شک خستن؛ دوەدڵ وسەی.

**تشکیل** / taškîl/: [عربی]/اسم. ١. کار یان ڕەوتی درووس بوون؛ بەدیهاتن و ڕواڵەت گرتنی شتێک بە هۆی لێک خڕ بوونەوەی هۆکارگەلی بنەڕەتییەوە ‹تشکیل جنین: درووس بوونی ئاولەمە› ٢. کار یان ڕەوتی پێکهاتن؛ دامەزران؛ دروست بوون؛ پێکهێنان؛ پێکنان؛ ڕێکخستن؛ ئەرەمەرزنەی؛ ئەرەمەرزیەی؛ نەریتدار کردنی بنکە یان کۆمەڵەیەک ‹تشکیل خانواده؛ تشکیل دادگاه: دامەزرانی بنەماڵە؛

پێکهێنانی دادگا›.

⊡ **تشکیل‌دادن**: ١. ڕێکخستن؛ دامەزراندن؛ ئەرەمەرزنەی ‹یک حزب تشکیل دادیم: حیزبێکمان ڕێکخست› ٢. پێک‌هێنان؛ درووس‌کردن؛ چێ‌کرن؛ بەدیهێنان ‹چند سکە و یک خودکار سرمایەی تو را تشکیل می‌دهد: چەن دراو و پێنووسێک دەسمایەی تۆ پێک‌دێنن›.

**تشکیل شدن/ یافتن**: درووس بوون: ١. ساز بوون؛ سازران؛ دامەزران؛ مەرزیایرە؛ ڕێکخران؛ ڕێ‌خران ‹راهپیمایی تشکیل شد: ڕێ‌پێوان سازدرا› ٢. بەدیهاتن؛ پێک‌هاتن؛ وەش بیەی ‹کالبد انسان از ٣٦٠ استخوان تشکیل شده است: پەیکەری مرۆ لە ٣٦٠ ئێسقان پێک‌هاتووە›.

**تشکیلات** / taškîlāt/: [اعربی]/اسم. ڕێکخراوە؛ ڕێخراوە؛ ڕێخستەک؛ دەزگا ‹تشکیلات اداری: ڕێکخراوەی مەزرینگەیی›.

**تشکیلاتی** / taškîlātî/: [اعربی] صفت. ڕێکخراوەیی؛ ڕێخراوەیی؛ تەشکیلاتی: ١. سەر بە ڕێکخراوە ‹بنیان تشکیلاتی: بنەمای ڕێکخراوەیی› ٢. ئەندامی ڕێکخراوە ‹هیچ یک از دستگیر شدگان تشکیلاتی نبودند: هیچ کام لە گیراوەکان تەشکیلاتی نەبوون›.

**تشنج** / tašannoc، ـها؛ ـات/: [اعربی]/اسم. ١. شڵەژاوی؛ بشێوەیی؛ ناهێمنی؛ ئاڵۆزی ‹از ایجاد تشنج در حوزەهای رأی‌گیری جلوگیری خواهد شد: لە ڕوودانی شڵەژاوی لە ناوەندەکانی دەنگداندا بەرگری دەکرێ› ٢. *[پزشکی]* ڕەقیتە؛ بزرکاوی؛ کار یان ڕەوتی گرژ بوون؛ گرژ بوونی یەک لە دوای یەکی ماسوولکەگەل بە هەلزرنگانی مێشک.

**تشنج‌آفرین** / tašannocāfarîn، ـان/: [اعربی/ فارسی] صفت. بشێوێنە؛ ئاژاوەگێڕ؛ ئاژاولەخۆشکەر؛ شێوان‌شێوکار؛ کەتن‌گێڕ ‹باید از سخنان یا کارهای تشنج‌آفرین پرهیز کرد: دەبێ لە قسە یان کاری [illegible] دووری بکرێ›. هەروەها: **تشنج‌آفرینی**

**تشنج‌زا** / tašannoczā/: [اعربی/ فارسی] *صفت.* کەتن‌گێڕ؛ گێرەشێوێن؛ شێوەژنە؛ تایبەتمەندیەک کە ببێتە ئامیانی شڵەژان.
هەروەها: **تشنج‌زایی**

**تشنج‌زدایی** / tašannoczedāyî، ـها/: [اعربی/ فارسی]/اسم. کار یان ڕەوتی هێمن کردنەوە؛ داکوژان، دامراندن و نەهێشتنی هۆکاری ئاژاوەگێڕی (بەتایبەت لە کەین و بەینی نێوان خەڵک یان دەوڵەتاندا).

**تشنگی** / tešnegî، ـها/: اسم. تینوێتی؛ توونیایەتی؛ تینوویەتی؛ تینوایەتی؛ تینگی؛ تینیەتی؛ تینواتی؛ تهنوویی؛ تنووەتی؛ تیەنگی؛ تەژنەی؛ تەژنایێ ‹از تشنگی هلاک شدم: لە تینوێتیدا قڕ بووم›.

⊡ **تشنگی آوردن**: تینوێتی هێنان؛ تەژنایێ ئاردەی ‹دوغ شور تشنگی می‌آورد: دۆی سوێر تینوێتی دێنێ›.

**تشنگی دادن**: بە تینوویەتی داخستن؛ لە تینوویەتیدا هێشتنەوە؛ تەژناییێنە ئاسەیەوە ‹تا کی می‌خواهی ما را گرسنگی و تشنگی بدهی: تاکەی دەتەوێ بە برسیەتی و تینوویەتی دامابخەی›.

**تشنه** / tešne، ـها؛ ـگان/: *صفت.* تینوو؛ توونی؛ تینی؛ تینگ؛ تیەنگ؛ تی؛ تەژنە؛ تیهنی؛ تیهن؛ تیهە؛ تین؛ تیەنی: ١. نیازمەندی ئاو بۆ خواردنەوە ‹بچە تشنە است آب می‌خواهد: منداڵەکە تینوویە، ئاوی دەوێ› ٢. *[مجازی]* تامەزرۆ؛ خوازیار ‹تشنەی محبت: تامەزرۆی میهرەبانی›.

⊡ **تشنە بودن**: تینوو بوون: ١. بەنیازی ئاو بوون ‹خیلی تشنەام بود: زۆر تینوو بووم› ٢. *[مجازی]* زۆر خوازیار بوون؛ تامەزرۆ بوون.

هەروەها: **تشنه شدن؛ تشنه كردن**

**تشنه‌لب** / tešnelab/ ☜ **لب‌تشنه**

**تشنيع** / 'tašnî/: [عربی]/اسم. [ادبی/] ١. ڕەوتی بە ناشیرین و نەگونجاو زانین ٢. [قدیمی/] خراپەبێژی؛ کار یان ڕەوتی بەدناوکردن؛ ناو زڕاندن.

**تشويش** / tašvîš، ـها/: [عربی]/اسم. پەشێوی؛ پەرێشانی؛ پەشۆکاوی؛ شاشی؛ شێواوی؛ پەرۆشی؛ شڵەژاوی؛ بزاڵ؛ بڵاوی و پەرێشانی؛ پرژ و بڵاوی؛ شپرزەیی؛ هەوو فرۆنی؛ ئاڵۆزی هزری لە سۆنگەی نیگەرانیەوە.

◙ **تشويش اذهان**: ڕەوتی بیرئاڵۆزکردن؛ شێواندنی هزر و بیری خەڵک.

◙ **به تشويش افتادن**: پەشۆکان؛ شڵەژان؛ پەرێشان بوون؛ شپرزە بوون؛ کەوتنە پەرۆشەوە؛ پەشۆکیەی؛ تووشی نیگەرانی هاتن ‹از شنيدن خبر بيمارى پدرش به تشويش افتاد: لە بیستنی هەواڵی نەخۆشی بابی پەشۆکا›.

**در تشويش بودن**: بە پەرۆش بوون؛ شێوان ‹از ديروز تا به حال در تشويش بودم: لە دوێنێوە تا کوو ئێستا بە پەرۆشم›.

**تشويق** / tašvîq، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ئافەرین و ستایش؛ کردەوەیەک کە ببێتە هۆی دڵگەرمی، ویست و داخوازی لە کارێکدا.

◙ **تشويق شدن**: ١. دڵگەرم بوون ‹از ديدن هيجان مردم تشويق شد و كارش را دنبال كرد: لە پێشوازی خەڵکی دڵگەرم بوو و کارەکەی درێژە پێدا› ٢. دڵگەرمکران؛ لە ئەنجامدانی کارێکی شیاو و لەبار دەستخۆشانە و ئافەرین وەرگرتن ‹از سوى حاضران تشويق شد و برايش كف زدند: لە لایەن ئامادەبوانەوە دڵگەرم کرا و چەپڵەیشی بۆ لێدرا›.

**تشويق كردن**: ١. دڵگەرمکردن؛ فتردان ‹پدرم من را به اين كار تشويق كرد: بابم بۆ ئەم کارە دڵگەرمی کردم› ٢. بە بۆنەی ئەنجامدانی کارێکەوە ئافەرین و پەسند کردن.

**تشويق‌نامه** / tašvîqnāme، ـها/: [عربی/فارسی]/اسم. ئافەریننامە؛ نامەیێک کە بە کەسێکی دەدەن بە بۆنەی کارێکی چاکەوە کە کردوویەتی و تێیدا پەسنی دەدەن.

**تشويقى** / tašvîqî/: [عربی] صفت. بۆ دڵگەرمی؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی پەسندان و دڵگەرمکردنەوە.

**تشويه** / tašviye/: [عربی]/اسم. ١. [قدیمی/] کار و ڕەوتی بووژانەوە؛ ژووژانەوە؛ دیسان سەرهەڵدانەوە ٢. [شیمی/] ئوکسیداسیون؛ تێکئاڵاوی لەگەڵ ئوکسیژندا بە هۆی گەرماوە.

**تشهد** / tašahhod/: [عربی]/اسم. شایەت؛ شایەت و ئیمان؛ شاتیمان؛ کار یان ڕەوتی شادە هێنانەوە.

◙ **تشهد گفتن**: شایەتی وتن؛ شایەتی هێنان؛ شایەتیمان هێنان.

**تشى** / tašî، ـها/: /اسم. سووچەر؛ سووچەڕ؛ سیچەڕ؛ سیچڕ؛ گیانلەبەرێکی گوهانداری شەوگەڕە لە ڕاستەی خۆراکجاوان بە درێژی میترێک و بە ڕەنگی ڕەشی ئامال سوور کە سەرپشتی بە درکی درێژ و تیژ داپۆشراوە: **گربه‌تيغى**

**تشيع** / 'tašayyo/: [عربی]/اسم. تەشەییوع؛ ناوی دەستەیەک لە ڕێبازگەلی ئیسلامیە کە پەیڕەوانی، ڕابەری و پێشەوایی موسڵمانان بە مافی خودایی عەلی کوڕی ئەبیتالب و زارۆکانی دەزانن.

**تشييد** / tašyîd/: [عربی]/اسم. [ادبی/] کار یان

ڕەوتی پتەوکردنەوە؛ قورس و قایم‌کردنەوە ‹تشیید مبانی اسلام: پتەوکردنەوەی بنەماکانی ئیسلام›.

**تشییع** / taŝyî'/: [عربی]/اسم. خستنەڕێ؛ کار یان ڕەوتی وەڕێ خستن و ڕوانەکردنی تەرم: **تشییع جنازه**

▣ **تشییع جنازه:** وەڕێ خستن و بەشداری لە ناشتنی مردوودا.

▣ **تشییع شدن:** بەڕێ‌کران؛ ڕوانەکران (بۆ تەرم).

**تشییع کردن:** بەڕێ‌کردن؛ ڕوانەکردن (بۆ تەرم).

**تصاحب** / tasāhob/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی داگیرکردن؛ داوڕکردن؛ دەست بە سەرداگرتن؛ گێرتەیرە؛ بە دەست هێنانی خاوەنیەتی شتێک (بە تایبەت لە ڕێگای زۆر و بە شێوەی دوور لە قانوونەوە) ‹ارباب، خانەی او را تصاحب کرد: ئاغا، ماڵەکەی لێ داگیرکرد›.

**تصادف** / tasādof، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. پێشهاتە؛ پێشهات؛ ڕێکەوت ‹تصادف روزگار است: پێشهاتەی ڕۆژگارە› ٢. کار یان ڕەوتی لە یەکدان؛ لێکدان؛ لێکەوتن؛ دەیونەیۆی؛ پێکدادان ‹دیروز نزدیک بود با یک موتور تصادف کنم: دوێنێ خەریک بوو دەگەڵ موتورێک لێکبدەین›.

▣ **تصادف غیر مترقبه:** ڕزم؛ لێکەوتی لە ناکاو؛ ڕووداوێ کە پێشبینی نەکراوە.

▣ **تصادف شدن:** لێکدان یان لێکەوتنی کەرەسەیەکی هات‌وچۆ لەگەڵ کەسێ یان شتێکدا. هەروەها: **تصادف کردن**

**تصادفاً** / tasādofan/: [عربی]قید. لەپڕ؛ لە پڕی؛ لەپڕا؛ لەپڕ و نەکاو؛ لەناکاو؛ ناکا؛ ناگا؛ کوت‌وپڕ؛ گزوگوم؛ گزوگومبەت ‹تصادفاً او را دیدم: لە پڕ بینیم›.

**تصادفی**[1] / tasādofî/: [عربی] صفت. ڕێکەوتی: ١. بەختەکی؛ هەڵکەوت؛ هەڵکەفت؛ هۆرکەوت؛ هەڵکەوتی؛ بە هەڵکەوت ‹دیدارشان تصادفی بود: چاو پێکەوتنیان ڕێکەوتی بوو› ٢. /ـها/ لێدراو؛ کەوتنە بار و دۆخی وێکەوتنەوە.

**تصادفی**[2]: قید. [گفتاری] بەختەکی؛ بە هەڵکەوت؛ بە هۆرکەوت؛ کوت‌وپڕ؛ لە خۆوە؛ وێشەوە؛ هەروا؛ خۆبەختی ‹تصادفی از آنجا می‌گذشتم: بەختەکی بەوێدا تێدەپەڕیم›.

**تصادم** / tasādom، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی لێکدان، پێداماڵین، پێکدادان، پێک هەڵچوون، پێکەوە هەڵتەقیان و لێک‌کەوتن؛ لە یەکدان کە زۆرتر هاوڕێ لەگەڵ زەرەر و خەسارە ‹بر اثر تصادم بە لبەی پلە شکستە است: بە هۆی لێکدان بە لێواری پلەکەوە شکاوە›.

**تصاعد** / tasā'od/: [عربی]/اسم. ١. [نامتداول] ڕەوتی بەرزەوە بوون؛ بەرەو ژوور چوون، سەرکەوتن، هەڵدانەوە؛ هەڵچوون، هەڵکشان، هەڵڕۆیین ٢. /ـها/ [ریاضی] ڕیزێکی چندراو لە چەندین ژمارە کە هەر ژمارە لەگەڵ ژمارەی پێشوویدا خاوەن ڕێژەیەکی یەکسانە.

▣ **تصاعد عددی:** جۆرێک بەرزەوە بوون کە هەڤیازی هەر دوو ژمارە، بەردەوام شتێکی نەگۆڕە (وەک ٢، ٤، ٦، ٨ ...).

**تصاعد هندسی:** جۆرێک هەڵدانەوەیە کە هەر ژمارەیەک دوو یان چەند بەرامبەری ژمارەی پێشووە (وەک ٢، ٤، ٨، ١٦، ...).

**تصانیف** / tasānîf/: [عربی] جمعِ ☜ **تصنیف**

**تصاویر** / tasāvîr/: [عربی] جمعِ ☜ **تصویر**

**تصحیح** / tashîh، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. هەڵەگری؛ هەڵەچنی؛ هەڵەبژێری؛ کار یان ڕەوتی ڕاستکردنەوە؛ ڕاستەقەکرن و دروستکردنی ئەوەی کە هەڵە، ناڕاست

یان ناتەواوە ‹این مقالە باید تصحیح شود: ئەم گوتارە دەبێ هەڵەگری بکرێ›. ٢. ئەوەی کە لە نووسراوەیەکدا لە سۆنگەی هەڵە یان نەشیانەوە بگۆڕدرێت.

▣ تصحیح کردن: ١. ڕاستکردنەوە؛ دروستکردنی شتێ کە هەڵە یان ناتەواوە ‹حرفم را تصحیح می‌کنم: قسەکەم ڕاست دەکەمەوە›. ٢. *[چاپ]* هەڵەگرتن؛ هەڵە سڕینەوە؛ هەڵە لابردن؛ پەڵە سڕینەوە؛ دەستنیشانکردنی هەڵەی چاپی لە نووسراوەیەکدا ‹تصحیح کردن هر صفحە نیم ساعت وقت می‌برد: هەڵەگرتنی هەر لاپەڕەیەک نیو ساعەت دەخایێنێ›. ٣. *[ادبی]* بەرامبەرکردنەوە؛ دیاریکردنی جیاوازی نێوان نوسخەگەل، نیشانەگەلی خاڵبەندی و لێ داکەوتوویی نووسراوەیەکی کۆن ‹ملا عبدالکریم مدرس کتابهای زیادی را تصحیح کردە است: مەلا کەریم کتێبی زۆری بەرامبەر کردووەتەوە›. ٤. هەڵەگریکردن؛ هەڵەگرتن؛ ورد بوونەوە لە نووسراوەی خوێندکاران بە مەبەستی دیاریکردنی ڕاست و دروست و هەڵە و پەڵەکانی و نمرە پێدان ‹می‌خواهم ورقەهای امتحانی را تصحیح کنم: دەمەوێ وەرەقەکانی ئەزموونەکە هەڵەگری بکەم›.

**تصحیف** / tashîf/: [عربی]/اسم. ١. هەڵەی قەستی یا سەهوی لە نووسین یان خوێندنەوەی وشەیەک بەتایبەت لە بواری جێبەجێکردنی خاڵ یان جووڵەوە (وەک «نان» و «بان») ٢. لـ‌ها/*[ادبی]* وشەیەک لە هەڵبەستدا کە بشێ بە کەم و زۆرکردنی خاڵەکانی، واتاکەی بگۆڕدرێت (وەک «سێو» و «شێو»).

**تصدق** / tasaddoq/: [عربی]/اسم. ١. کاری سەدەقە و یارمەتی دان ٢. خەیرات؛ بەلاگەردانی؛ بەلاوەگێڕی؛ یارمەتی؛ دەسگرۆیی؛ ئەوەی بە ناوی سەدەقە دەدرێ.

▣ از تصدق سر کسی: بە سایەی سەر کەسێکەوە؛ بە بۆنەی ئاوڕدانەوە لە چاکی و چۆنیدا ‹از تصدق سر شما وضعمان بد نیست: بە سایەی سەری ئێوەوە بارودۆخمان خراپ نیە›.

▣ تصدق دادن: خەیراتکردن؛ دەسگرۆیی دان؛ سەدەقەدان.

تصدق کسی شدن: لە دەوری کەسێ گەڕان؛ بوون بە قوربانی کەسێک؛ لە بەر دەم کەسێ مردن؛ بە فیدای کەسێک بوون.

**تصدی** / tasaddî/: [عربی]/اسم. وەئەستۆگری؛ دەستپێشکەری؛ کار یان ڕەوتی لە ئەستۆدا بوون ‹او تصدی آن شغل را داشت: ئەو کارەی وەئەستۆ بوو›.

▣ در تصدی داشتن: لە ئەستۆ بوون؛ بە دەستەوە بوون.

**تصدیع** / tasdî'/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ١. *[نامتداول]* سەرئێشە ٢. *[مجازی]* دەردیسەر؛ کار یان ڕەوتی چرووساندن، ڕەنج پێدان، زەباندن، زەحمەت و ئازار دان ‹این قسم از راه تصدیع بسیار و زحمت بی‌شمار دارد: ئەم بەشەی ڕێگە، دەردیسەری زۆر و زەحمەتی زەمەندی هەیە›.

▣ تصدیع دادن: سەر ئێشاندن؛ سەر و دڵ گرتن؛ بە قسەی زۆرەوە سەری کەسێک هێنانە ئێش؛ زەحمەت پێدان؛ کاتی کەسێک گرتن.

**تصدیق** / tasdîq/: [عربی]/اسم. ـها/. ١. کار یان ڕەوتی گەواهی دان لە سەر دروستی شتێک؛ شایەتی دان ٢. لـات/*[قدیمی]* گەواهینامە؛ تەسێق.

◙ **تصدیق امضا**: گەواهی ئیمزا.

◘ **تصدیق کردن**: سەلماندن؛ شایەتی دان لە سەر دروستی یان ڕاست بوونی کار یا قسەیەک.

**تصرف** / tasarrof، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. داوڕ؛ داگیر؛ کار یان ڕەوتی دەست بە سەرداگرتن؛ گرتنە دەستەوە ‹هلاکو بغداد را تصرف کرد: هۆلاکۆ بەغدای داوڕ کرد› ٢. گۆڕانکاری؛ کار یان ڕەوتی دەس لێدان و دەست بردنە ناو شتێک و بە کەیفی خۆ گۆڕانی ئەو شتە ‹دخل و تصرف: دەس تێوەردان و گۆرانکاری›.

◙ **تصرف عدوانی**: */حقوقی/* داوڕی دوژمنانە؛ داگیری دزانە؛ کار یان ڕەوتی داگیر کردنی ماڵ و سامانێک بەبێ ئاگاداری یان ڕەزامەندی خاوەنەکەی.

**تصریح** / tasrîh، ـات/: [عربی]/اسم. ڕاشکاوی؛ ئاشکرایی؛ ڕوونی؛ کار یا ڕەوتی ڕوون کردنەوەی قسەیەک.

◘ **تصریح کردن**: بە ڕاشکاوی ڕاگەیاندن؛ ڕوون کردنەوە؛ بە ئاشکرا قسەکردن؛ ڕەپ و ڕاست گوتن ‹استاندار تصریح کرد کە سیل‌زدگان هنوز اسکان داده نشده‌اند: پارێزگار بە ڕاشکاوی ڕایگەیاند کە بەرلافاو کەوتووان هێشتا سامان نەدراون›.

**تصعید** / tas'îd/: [عربی]/اسم. */شیمی/* داگەڕانی ڕاستەوخۆی شتێک لە دۆخی خۆگرەوە بۆ دۆخی گاز (بێ‌ئەوەی ببێتە تراو).

**تصغیر** / tasqîr/: [عربی]/اسم. چووکی؛ چکۆلەیی؛ کار یان ڕەوتی بچووک کردنەوە؛ داشکاندنەوە، بەتایبەت چووک کردنەوەی ناوێک (وەک: پسرک: کوڕیژگە، کوڕیژە. کاف لە فارسیدا پاشبەندی چکۆلەییە).

**تصفح** / tasaffoh/: [عربی]/اسم. */ادبی/* ١. کار یان ڕەوتی هەڵدان و دانەوەی پەڕەی کتێب، گۆڤار و...؛ لاپەڕە دانەوە ٢. */مجازی/* کار یان ڕەوتی چاو خشاندن؛ خوێندنەوەی سەرسەری؛ خوێندن بەبێ ورد بوونەوە.

**تصفیه** / tasfiye، ـها/: [عربی]/اسم. ١. کار یان ڕەوتی پالاوتن؛ داپالوین؛ نەسەلنایش؛ پاڵفتەکردن و سافکردنی شتێک ‹تصفیه‌ی نفت: پالاوتنی نەوت› ٢. */مجازی/* پاکسازی؛ کار یان ڕەوتی لە ناو بردن یا داماڵین ‹باید اداره‌ها را از کارکنان ناباب تصفیه کرد: دەبێ مەزرینگەکان لە مووچەخۆرانی ناباو پاکسازی بکرێن›.

**تصفیه‌حساب** / tasf iyehesāb، ـها/: [عربی] /اسم. تسویه حساب ☜ **تسویه**

◘ **تصفیه حساب کردن با کسی**: */مجازی/* تۆڵە سەندنەوە/ کردنەوە لە کەسێک؛ لە حەساو کەسێ پاکەو بوون ‹با این کار خواست با سارا تصفیه حساب کند: بەم کارە ویستی لە سارا تولە بسینیتەوە›.

**تصفیه‌خانه** / tasfiyexāne، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پالاوگە: ١. شوێنێ بۆ پالاوتن کە ئامراز و دامەزراوە و شتومەکی شیاوی تێدایە ‹تصفیه‌خانه‌ی آب: پالاوکەی ئاو› ٢. پالایشتگا؛ دامەزراوەی پالاوتنی نەوت.

**تصلب** / tasallob، ـها/: [عربی]/اسم. */پزشکی/* دۆخ یا چۆنیەتی سفت یا سەختەوە بوون.

◙ **تصلب شرایین**: سفت و ئەستوور بوونەوەی دیوارۆکەی دەمار، کە زۆرتر بە هۆی نیشتنەوەی کولوسترۆڵ و چەوری لە ناوەوەی ڕەگە سوورەکاندا بەدی دێ.

**تصلب متعدد** ☜ **ام.اس.**

**تصلب منتشر** ☜ **ام.اس.**

**تصمیم** / tasmîm، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم.

بڕیار: ۱. تەما؛ ئەوەی مرۆ بە یارمەتی زەین و بیر دەری دەبڕێ ‹تصمیم نسنجیده: بڕیاری هەڵنەسەنگراو› ۲. ویست؛ تەما؛ گەرەک؛ خواستێ کە چیدی دوودڵی تێدا نیە ‹تصمیم این شد که ... : بڕیار درا کە...› ۳. بیر و ڕا یان داوەری کۆتایی کە جێ بۆ قسە ناهێڵێتەوە ‹تصمیم قاضی این شد: بڕیاری داوەر ئەمە بوو›.

▣ تصمیم داشتن: گەرەک بوون؛ هەرەک بوون؛ خواستن؛ ویستن؛ لە سەر بوون ‹تصمیم داشت خانه بخرد اما پول کافی نداشت: گەرەکی بوو ماڵ بکڕێ بەڵام پاری پێویستی نەبوو›.

تصمیم گرفتن: بڕیاردان؛ قەراردان ‹تصمیم گرفتن دشوار است: بڕیاردان دژوارە›.

**تصمیم‌گیری** / tasmîmgîrî، ـها/: [عربی/فارسی]/اسم. بڕیاردەری؛ کار یا ڕەوتی بڕیاردان و لێبڕان بۆ کارێک ‹تصمیم‌گیری بر عهدەی شماست: بڕیاردان بە ئەستۆی ئێوەیە›.

**تصنع** / tasanno'/: [عربی]/اسم./ادبی/ ۱. ڕواڵەتکاری؛ ڕواڵەتسازی؛ ڕواڵەت بازی ۲. کاری خۆ ڕازاندنەوە.

**تصنعی** / tasanno'î/: [عربی] صفت. دەسکردی؛ نارەسەن؛ ڕواڵەتی؛ ناڕاست ‹لبخند تصنعی: پێکەنینی ڕواڵەتی›.

**تصنیف** / tasnîf، ـها؛ تصانیف/: [عربی]/اسم. ۱. هۆنراوە؛ گۆرانی؛ هەڵبەستێکی کورت کە بۆ ئاواز وتن هۆنراوەتەوە. هەروەها: **تصنیف خواندن؛ تصنیف ساختن** ۲. کار یان ڕەوتی هۆنینەوە و داهێنانی بەرهەمی هونەری (وەک شیعر، چیرۆک، ستران، شانۆنامە و...).

▣ تصنیف کردن: هۆنینەوە؛ داهێنانی بەرهەمی ئەدەبی یا هونەری.

**تصنیف‌خوان** / tasnîfxān، ـها؛ ـان/: [عربی/فارسی]/اسم. گۆرانیبێژ؛ سترانبێژ؛ سترانڤان؛ گۆرانیواچ. هەروەها: **تصنیف‌ساز**

**تصور** / tasavvor، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. تێڕوانی: ۱. گومان؛ کار یان ڕەوتی بۆچوون؛ هێنانە بەرچاو؛ داوەری یا بڕوا بە شتێ لە ڕووی زانیاری زەینیەوە ‹تصور من این است: تێڕوانی من ئەمەیە› ۲. /منطق/ وێنەیەک کە لە مێشکدا دەردەکەوێ بێ ئەوەی بڕیارێک بە هیچ بارێکدا سەبارەت بەو شتەوە بدرێت.

▣ تصور کردن: ۱. هاوردنە بەر چاو؛ هێنانە پێش چاو ‹خانەای را تصور کنید کە در جنگلی است: ماڵێک بهێننە بەر چاو کە لە لێڕەوارێکە›. هەروەها: **بە تصور درآوردن** ۲. وا زانین؛ ئەجیەی ‹تصور کردم رفتەای: وامزانی ڕۆیشتووی›.

بە تصور درآوردن ☜ **تصور کردن ـ۱**

**تصوف** / tasavvof/: [عربی]/اسم. سۆفیەتی؛ سۆفیگەری؛ ئامۆژەیەکی عیرفانی لە بارەی پەیوەندی مرۆڤ و خودا و ڕێگەی ناسینی خوا، کە لە کۆتایی سەدەی هەوەڵی کۆچی لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا بەدیهات.

**تصویب** / tasvîb/: [عربی]/اسم. پەسەند؛ پەسند؛ کار یان ڕەوتی ڕەوا زانین و ڕادان لە سەر کارێک، بەتایبەت لە لایەن بنکەیەکی باوەڕ پێکراوەوە و بوونە هۆی پەسندکران و پەسند بوونی شتێک ‹مجلس طرح پیشنهاد شده را تصویب کرد: پارلەمان گەلاڵەی پێشنیار کراوی پەسندکرد›.

▣ بە تصویب رساندن: پەسندکردن؛ ڕا لە سەر دان؛ بوونە هۆی پەسندکران و پەسند بوونی شتێک. هەروەها: **تصویب شدن؛ تصویب کردن**

**تصویب‌نامە** / tasvîbnāme، ـها/: [عربی/فارسی]/اسم. پەسندنامە؛ ڕێوشوێنێ کە لە لایەن کۆمەڵەی وەزیرانەوە سەبارەت بە

بابەتێک دادەنرێ.

**تصویبی** / tasvîbî/: [عربی] *صفت* پەسندی؛ پەسندکراو.

**تصویر** / tasvîr، ـها؛ تصاویر/: [عربی]/*اسم*. وێنە؛ ئاشۆپ؛ شێوە؛ شکڵ و بیچمی شتێ لە سەر ڕووپەڕێک، وەکوو نەققاشی، ڕەسم و... ‹تصویر حقیقی: وێنەی ڕاستەقانی›.

▣ **تصویر کردن**: ١. کێشان؛ وێنە یان دیمەنێک نەققاشی کردن ٢. نیگار کێشان؛ نەخش کێشان ٣. *[مجازی]* پیشاندان؛ نیشاندان؛ ڕانانی شتێک بە هۆی ئامرازی دیتنیەوە ٤. گێڕانەوە بە شێوەیەک کە ئەوی ڕووی داوە بێتە پێش چاوی بیسەرانەوە ✻ **به تصویر کشیدن**

**به تصویر کشیدن** ☜ **تصویر کردن**

**تصویربردار** / tasvîrbardār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. وێنەگر؛ وێنەهەڵگر؛ فیلمهەڵگر؛ کەسێ کە لە ڕووداو یا دیمەنێک وێنە هەڵدەگرێ.

**تصویربرداری** / tasvîrbardārî، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. وێنەگری؛ وێنەهەڵگری؛ کار یا ڕەوتی چێ کردن یا هەڵگرتنی وێنە یا فیلم.

**تصویرسازی** / tasvîrsāzî، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. وێنەسازی؛ کار یا ڕەوتی بەدیهێنانی وێنە بە تایبەت لە بیری گوێگردا.

**تصویرگر** / tasvîrgar، ـان/: [عربی/ فارسی] /*اسم*. ١. نیگارکێش؛ وێنەکێش؛ نەققاش ٢. کەسێ کە بۆ کتێب، گۆڤار یا وتارێک وێنەی شیاو دابین دەکات. هەروەها: **تصویرگری**

**تصویرگرا** / tasvîrgerā، ـیان/: [عربی/ فارسی] *صفت*. ئیمەیژیست؛ وێنەوەگر؛ لایەنگر و پەیڕەوی وێنەگری: **ایماژیست**

**تصویرگرایی** / tasvîrgerāyî/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. ئیمەیژیسم؛ وێنەوەگری؛ ڕەوتێک لە شیعری ئەورووپا، کە لە دەکانی دووهەمی سەدەی بیستەمدا لە ئینگلیز سەری هەڵدا و تایبەتمەندی گەورەی ئەوەیە کە شیعری ئازاد و وتنەوەی بیرۆکەگەل و دۆخی هەستیاری بە شێوەیەکی ساکار و وێنەگەلێکی زۆر بەرچاو و ڕاشکاو بەدی هێنا: **ایماژیسم**

**تصویری** / tasvîrî، ـها/: [عربی]/*اسم*. ١. وێنەیی؛ شێوەیی؛ پەیوەندیدار و سەبارەت بە وێنەوە ‹لوازم تصویری: ئامرازی وێنەیی› ٢. وێنەدار؛ بە وێنە ‹نمایش تصویری: نمایشتی وێنەدار›.

**تضاد** / tazād(d)، ـها/: [عربی]/*اسم*. دژەتی؛ دژایەتی؛ دژیەتی؛ دۆخ یا چۆنیەتی دژ و ناکۆک و ناتەبا بوون ‹تضاد اجتماعی: دژەتی کۆمەڵایەتی›.

▣ **تضاد طبقاتی**: دژایەتی چینگەل؛ دژ بە یەک بوونی هەڵویست و قازانجی دوو یان چەند چین لە حاندی یەکدا لە کۆمەڵگایەکدا.

▣ **تضاد داشتن**: ناکۆک بوون؛ دژ بوون؛ بە دژایەتی بوون ‹این رنگها با هم تضاد دارند و چشم را آزار می‌دهند: ئەم ڕەنگانە پێکەوە ناکۆکن و چاو ئەتارێنن›: **در تضاد بودن**

**در تضاد بودن** ☜ **تضاد داشتن**

**تضارب** / tazārob/: [عربی]/*اسم*. *[ادبی]* کار یان ڕەوتی وێکەوتن؛ پێکدان؛ لێکدان؛ پێکدادان.

▣ **تضارب آرا**: هاتنە ئارای بیر و ڕای جیاواز و لێدوان لە سەریان.

**تضامنی** / tazāmonî/: [عربی] ☜ شرکت تضامنی، **شرکت**

**تــضرع** / tazarro' ـهـا؛ ـات/: [عربـی]/اسـم. كـزاف؛ كازـكـاز؛ كـار يـان ڕەوتی پاڕانــەوە؛ لالانــەوە؛ خوايــشتی تێكــەڵ بــە گريــان و هاوارەوە.

▣ تــضرع كــردن: كرووزانــەوە؛ لالانــەوە؛ لالــيانەوە؛ پاڕانــەوە؛ نالــە و زاریكــردن؛ داواكـردنی شـتێ يـان كارێـك تێكـەڵ بـە شين و زاری ‹خيلی تضرع كرد، ولی فايدەای نداشــت: زۆر كرووزايــەوە، بــەلام كــەڵــكی نەبوو›.

**تــضعيف** / taz'îf/: [عربــی]/اســم. ١. كـار يـا ڕەوتی لاوازكــردن ‹نيروهــای دفــاعی را نبايــد تـضعيف كـرد: هێــزە بــەرگــرەكــان نابــێ لاواز بكرێنــەوە› ٢. كــار يــا ڕەوتی دوو بــەرامبــەر كردنەوە.

**تــضمن** / tazammon/: [عربــی]/اســم. داگــری؛ داگيری؛ پاوان‌كـاری؛ كـار يـان ڕەوتی گرتنـە بـەر؛ گرتنــەوە؛ گێرتــەيــرە وەر ‹تضمن خيلی چيزهاست: زۆر شت دەگرێتە بەر›.

**تــضمين** / tazmîn ـهــا/: [عربــی]/اســم. ١. دەستـەبـەری؛ كـار يـا ڕەوتی خـستنە پـەنـای خـۆ و دەســتەبــەركــردن ‹تضمين كـار او بـە عهـدەی مـن اسـت: دەستـەبـەری كـاری ئـەو لـە ئـەستۆی منـە› ٢. دابـينی؛ دەسـتەبـەری ‹بـا تضمين قبولی: وێڕای دەستـەبـەری سـەركـەوتـن› ٣. *[ادبـی]* تێهـەڵــكێش؛ تێكهــەڵــكێش؛ وەرگرتنی كەرت، بەيـت يـا چـەن بـەيتـێ لـە شاعيری ديكە و دانانی لـە نـاو شـيعری خـۆدا ‹قـانع برخـی اشـعار حـافظ را تـضمين كـرده اسـت: قانيع برێک لە شـيعرەكـانی حـافيزی تێهـەڵكێش كردووە›.

**تـــضمينی** / tazmînî/: [عربـــی]/اســـم. دەستەبەركـراو؛ دەسـتەبـەری ‹كـلاس تضمينی: كلاسی دەستەبەركراو›.

**تـضييع** / tazyî'/: [عربـی]/اسـم. خـەسـار؛ زايـە؛ خراپ؛ فيڕۆ ‹جز تـضييع عمـر چيـز ديگـری نيـست: جگە لە خەساری تەمەن شتێكی‌تر نيە›.

▣ تضييع شـدن: پـێشـێل بـوون/ كـران؛ زايـە بوون؛ بە خـەسـار چـوون؛ لـەكـيس چـوون؛ خراو بوون؛ بە فێـڕۆ چـوون ‹حـق مـن تـضييع شد: مافی من پی‌شێل بوو›.

تضييع كـردن: پـێشـێل‌كـردن؛ زايـەكـردن؛ خراوكردن؛ بـە خـەسـار دان؛ بـە فێـڕۆ دان؛ لـە بـەيـن بـردن ‹تـضييع كـردن حقـوق مـردم: پی‌شێل كردنی مافی خەڵک›.

**تــضييق** / tazyîq ـات/: [عربـی]/اسـم. *[ادبـی]* ١. *[نامتــداول]* تــەنگانــە ٢. ســەختگــری؛ دژواركــاری؛ كــار يــان ڕەوتی تــەنــگ پێ‌هەڵچنين؛ خستنە تـەنگانـەوە؛ تـەنگـاو پـێ كردن.

**تطــابق** / tatāboq/: [عربـی]/اسـم. وەكيـەكـی؛ دۆخ يـان چۆنيـەتی وێـك هاتنـەوەی دوو يـان چەند شت.

▣ تطـابق چـشم: هانـا كـردنی چـاو؛ بڕسـتی چـاو بـۆ ڕوون و جـوان ديـتنی شـت، كاتـێ دوور و نزيک دەبێتەوە.

**تطـاول** / tatāvol ـات/: [عربـی]/اسـم. *[ادبـی]* ١. دەس‌درێـژی؛ گـووج؛ سـتەم ٢. بـێ‌حـەيـايی؛ بێ‌شەرمی.

**تطبيـــق** / tatbîq/: [عربــی]/اســم. *[ادبـی]* ١. بــەرانبــەری؛ هــەمبــەری؛ هــەڤــبەری؛ هاوشێوازی شـتێ لـەگـەڵ يـەكێكی ديكـەدا، بە شێوەيەک كـە هـەر پاژێـک لـە يـەكێكيان، لەوی‌تردا هاوتايەكـی هـەبـێ ٢. بـەراورد؛ كـار يـان ڕەوتی هـەڵـسەنگانـدنی شـتێ لـەگـەڵ شــتێكی‌تــردا ٣. پێخــواردن؛ دۆخ يــان چۆنيـەتی بـە يـەک خـواردن يـان يـەک گرتنەوە.

▣ تطبيـق دادن: ١. بـەڕانبـەركـردن؛ لـە بـەر يەک دانـان؛ بـەرامبـەركردنـەوەی دوو شـت

بۆ زانینی ڕادەی وێکچوونیان ٢. بەراورد کردن؛ دەق‌بەدەق‌کردن؛ دەقاودەق‌کردن؛ بۆ زانینی ڕاستی و دروستی شتگەلێک، بەرامبەرکردنەوەیان.

**تطبیقی** / tatbîqî/: [عربی] *صفت*. بەراوردی؛ هەمبەری؛ هەڤبەری ‹زبان‌شناسی تطبیقی: زمان‌ناسی بەراوردی›.

**تطمیع** / tatmî'، ـها/: [عربی]/*اسم*. کار یان ڕەوتی خستنە تەماوە؛ چنۆک‌کردن؛ تەماح خستنە بەر.

**تطور** / tatavvor، ـات/: [عربی]/*اسم*. [ادبی] ئاڵوگۆڕ؛ گۆڕانکاری؛ دۆخ یان چۆنیەتی گۆڕیان؛ فرازین ‹زبان با گذشت زمان دستخوش تطور می‌شود: زمان بە تێپەڕ بوونی زەمان تووشی گۆڕانکاری دەبێت›.

**تطویل** / tatvîl/: [عربی]/*اسم*. کاری درێژە پێدان یان درێژەدار بوون؛ درێژکردن.

▣ **تطویل کلام**: درێژدادڕی؛ درێژەبێژی؛ درێژەدان بە قسە.

▣ **بە تطویل انجامیدن**: درێژە هێنان؛ خایاندن؛ بە درێژەکێشان؛ بە درێژە چوون؛ درەنگان کەوتن؛ فرە پێ‌چوون.

**تطهیر** / tathîr/: [عربی]/*اسم*. [ادبی] پاکسازی.

▣ **تطهیر شدن**: پاک بوونەوە؛ خاوێن بوونەوە؛ پوختە بیەیوە.

**تطهیر کردن**: پاکەوکردن؛ خاوێن‌کردن؛ لابردنی چەپەڵی؛ داشۆردن؛ پاقژ کردنەوە؛ پوختەکەردەی.

**تظاهر** / tazāhor، ـات/: [عربی]/*اسم*. ١. ڕواڵەتسازی ٢. کار یان ڕەوتی وا نیشاندان و نواندن؛ ئرمانەی ‹تظاهر کرد کە مرا ندیدە است: وای نیشاندا کە منی نەدیوە›.

**تظاهرات** / tazāhorāt/: [عربی]/*اسم*. گەلەکۆیی؛ کار یان ڕەوتی خۆپیشاندان؛ خۆشاندن؛ ڕێ‌پێوان؛ دەرکەوتنی بە کۆمەڵ بۆ دەربڕینی بۆچوونی تاقمێک، بە کۆ بوونەوە یان ڕێ‌پێوان ‹جلو دانشگاه تظاهرات بود: لە بەر زانستگادا خۆپیشاندان بوو›.

▣ **تظاهرات خیابانی**: خۆپیشاندانی ئاشکرا؛ گەلەکۆیی خیابانی؛ خۆپیشاندانێ کە لە بەر چاوی هەموو خەڵکەوە بە ئاشکرا ئەنجام بدرێ.

**تظلم** / tazallom، ـات/: [عربی]/*اسم*. [ادبی] فریاخوازی؛ دادخوازی؛ دادوازی؛ کار یان ڕەوتی داد بە دیوان بردن.

**تعابیر** / ta'ābîr، ـها/: [عربی] جمعِ ☜ **تعبیر**

**تعادل** / ta'ādol/: [عربی]/*اسم*. هاوسەنگی؛ خۆگری؛ چۆناوچۆنی خۆڕاگری لە شتێک یان گیاندارێک بە شێوەیەک کە خۆ بگرێ و نەکەوێ ‹نتوانست تعادل خودش را حفظ کند و افتاد: نەیتوانی هاوسەنگی خۆی ڕاگرێ و بە لادا هات›.

▣ **تعادل بی‌تفاوت**: هاوسەنگی لابەلا؛ دۆخی تەنێکی ڕاوەستاو کە ئەگەر هێزێکی کەم باری بگۆڕێ، لە سەر باری تازەش هەر هاوسەنگە.

**تعادل پایدار**: هاوسەنگی پایەدار؛ چۆناوچۆنی تەنێکی ڕاوەستاو کە ئەگەر هێزێک باری بگۆڕێ، هەمیسان دەڕواتەوە سەر باری پێشووی.

**تعادل ناپایدار**: هاوسەنگی ناپایەدار؛ چۆنیەتی تەنێکی ڕاوەستاو کە ئەگەر هێزێک هاوسەنگیەکەی تێکدا، دەکەوێ.

▣ **تعادل خود را حفظ کردن**: خۆگرتن؛ خۆ ڕاگرتن؛ هاوسەنگی خۆ ڕاگرتن؛ وێ گێرتەی؛ نەکەوتن.

**تعادل داشتن**: هاوسەنگ بوون؛ خۆگر بوون؛ خۆڕاگر بوون.

**تعادلی** / ta'ādolî/: [عربی] *صفت*.

هاوسەنگی؛ هاوکێشی؛ هاوتایی.

**تعارض** / ta'āroz، ـات/: [عربی]/اسم. ناتەبایی؛ ناکۆکی؛ ناسازگاری؛ نەبانی؛ نەوانی.

▣ تعارض داشتن: ناتەبا بوون؛ یەک نەگرتنەوە؛ ناسازگار بوون؛ پێکەوە هەڵنەکردن ‹گفتەهایش با عملش تعارض داشت: قسەکانی لەگەڵ کردەوەیدا بەکیان نەدەگرتەوە›: **در تعارض بودن**

در تعارض بودن ☜ **تعارض داشتن**

**تعارف** / ta'ārof، ـات/: [عربی]/اسم. ۱. تەعارف؛ مەکس؛ مکس؛ مسک؛ قسەی سەرزارەکی بەبێ کردەوە ‹اینها که می‌فرمایید تعارف است و واقعیت ندارد: ئەمانە کە دەفەرموون گشتی تەعارفن و بە راستی نیە› ۲. پێشکەشی؛ دیاری ‹تعارف دادن: پێشکەشی دان› ۳. [گفتاری] کار و بەردەستیەک کردن بە مرازی دۆستانەوە بەبێ چاوەنۆڕی.

▣ تعارف شاه عبدالعظیمی: بۆرە خولک؛ مکس ماکنالی؛ خولکێ کە لە ناخی دڵەوە نەبێ.

▣ تعارف تکه ـ پاره کردن:[تعریض] نان بە یەک دانە قەرز؛ بە بالای یەکدیدا هەڵگوتن ‹دو نفری نشسته بودند، تعارف تکه‌پاره می‌کردند: دوو کەسی دانیشتبوون نانیان بە یەک ئەدا بە قەرز›.

تعارف دادن: دیاری پێدان؛ پێشکەشی دان.

تعارف داشتن: رووەدربایسی هەبوون؛ داب و دەستوور لە بەر چاوگرتن ‹ما که با هم تعارف نداریم، خانەی خودتان است: ئێمە خۆ لە یەک رووەدربایسیمان نیە، ماڵی خۆتانە›.

تعارف کردن: ۱. خێراتن گوتن؛ خۆش هاتن کردن؛ خولک کردن ۲. خزمەت کردن؛ کار یان خزمەتێک بە خۆڕایی بۆ کەسێ کردن.

**تعارفات** / ta'ārofāt/: [عربی]/اسم. ۱. چاکوچۆنی؛ خۆشیوبێشی؛ وەشی و تشی؛ خێرهاتن و خۆش هاتن ‹پس از قدری تعارفات گفت که دنبال کار می‌گردد: دوای کەمێ چاکوچۆنی وتی بۆ کار دەگەڕم› ۲. [گفتاری] دابودەستوور.

**تعارفاتی** / ta'ārofātî/: [عربی] صفت. داب و دەستووری

**تعارفی**[1] / ta'ārofî، ـها/: [عربی]/اسم. [گفتاری] چاوڕۆشنی؛ دیاریەک کە بە کەسێکی گەورەتر یان هاوتەمەنی خۆی دەدەن.

**تعارفی**[2]: صفت. [گفتاری] داب و دەستووری.

**تعاریف** / ta'ārîf/: [عربی] جمعِ ☜ **تعریف**

**تعاقب** / ta'āqob/: [عربی]/اسم. [ادبی] شوێنگری؛ پەیجۆری؛ پەیگیری؛ پاشگیری.

▣ تعاقب کردن: شوێن کەوتن؛ شوێن گرتن؛ شۆن گێرتەی؛ شۆپ چوون؛ دوا بە دوای کەسێک یان شتێکدا چوون.

**تعالی** / ta'ālā/: [عربی] صفت. مەزن؛ مازن؛ پایەبەرز؛ پایەبلند؛ بلیندپایە؛ گەورە ‹خدای تعالی: خوای مەزن›.

**تعالی** / ta'ālî/: [عربی]/اسم. [ادبی] هەڤیازی: ۱. [نامتداول] بەرتری ۲. بەرزی؛ پێشڕەوت ‹موجب تعالی هنر معماری شد: بوو بە هۆی هەڤیازی هونەری نژیاری›.

**تعالیم** / ta'ālîm/: [عربی] جمعِ ☜ **تعلیم**

**تعامل** / ta'āmol، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. هاوکاری؛ ئاریکاری ۲. [قدیمی] سەودا؛ مامەڵە؛ دان و ستان؛ داوستەد.

**تعاون** / ta'āvon/: [عربی]/اسم. [قدیمی] هەرەوەز؛ هەرەوەنە؛ زبارە؛ دەستەوا؛

هاویاری؛ یاریدەری؛ دەستگیرۆیی.

**تعاونی**[1] / ta'āvonî، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. بنکەیەکی ئابووری کە لە ڕێگەی هاویاری و هاوکاری ئەندامانی، بە مەبەستی دابین کردنی قازانجی گشتیەوە دامەزراوە و بەڕێوە دەچێت ۲. زبارەیی؛ هەرەوەزی؛ کاری گەلەکۆمە؛ هەر شتێک بە هەرەوەزەوە پێوەندی هەبێ.

▣ **تعاونی توزیع**: هەرەوەزی دابەشین؛ هاوبەشییەکی دەستەوایی کە کاری بەشینەوەی کالایە. هەروەها: **تعاونی تولید**

**تعاونی کشاورزی**: هەرەوەزی کشتوکاڵ؛ زبارەی کشتوکاڵ؛ دابەشگەی هەرەوەزی کە بە ئاریکاری گرۆیێک وەرزێر پێک دێ. هەروەها: **تعاونی کارگری؛ تعاونی کارمندی**

**تعاونی**[2]: *صفت*. هەرەوەزی؛ زبارەیی؛ پێوەندیدار بە هاوباریەوە.

**تعب** / ta'ab/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ۱. داماوی؛ کوێرەوەری؛ ڕەنج و سەختی؛ ئەرک و زەحمەت؛ سەخڵەتی ۲. *[مجازی]* ئێش و ئازار؛ شەکەتی؛ ماندوویەتی؛ مانیاگی.

▣ **تعب کشیدن**: ڕەنج و سەختی کێشان؛ ئەرک و زەحمەت دیتن؛ ئێش و ئازار دیتن؛ چەم و خەم چەشتن.

**تعبد** / ta'abbod، ـات/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ۱. کۆیلەیی؛ کۆیلەتی؛ کۆیلایەتی ۲. کار و ڕەوتی پەرەستن ۳. *[کنایی]* ملکەچی؛ کار یان ڕەوتی وەرگرتن و پەزیرانی بێ پرس و ترس.

**تعبیر** / ta'bîr، ـها؛ ـات؛ تعابیر/: [عربی]/اسم. ڕاژە؛ ڕاقە؛ کار یان ڕەوتی لێکدانەوەی واتا و مەبەستێک کە لە وتە یان وشە، زاراوە یان چەند ڕستە پێک هاتووە.

▣ **تعبیر خواب**: پایژی؛ بژارەی خەو؛ شرۆڤەی خەو؛ لێکدانەوەی خەون.

**تعبیه** / ta'biye/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی دانان؛ نانەکار؛ نیایرە؛ ئەرە نیەی؛ دروست کردن یان خستنە ناو کارەوە ‹در داخل چاه باید جای پا تعبیه کرد: لە نێو بیردا دەبێ جێگە پێ دابنرێ›.

**تعجب** / ta'accob/: [عربی]/اسم. واقوڕماوی؛ سەرسووڕماوی: ۱. ڕاماوی؛ داماوی ‹دچار تعجب شد: تووشی واقوڕماوی بوو› ۲. بەلاجەوی؛ واق؛ واقوڕی؛ سەیر؛ سەمەرە؛ سەرنج ‹اسباب تعجب است: مایەی سەرسوورمانە›.

▣ **تعجب کردن**: پێ سەیر بوون؛ سەرسووڕمان؛ سەیرمان؛ واقوڕمان؛ ڕامان ‹وقتی او را با آن حالت دیدم خیلی تعجب کردم: کاتێک بەو شێوازە دیتم زۆرم پێ سەیر بوو›.

**تعجیل** / ta'cîl/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ۱. پەلە؛ لەز؛ پەلەپاتۆر؛ شتاو؛ هەشتاو ۲. پەلەپرووزی؛ خێرایی؛ هەولی؛ بلەزی؛ بەتاوی؛ هەشتاوی؛ کار و ڕەوتی پەلە کردن.

▣ **تعجیل داشتن**: بە پەلە بوون؛ بەلەز بوون ‹خیلی تعجیل داشت: زۆر بە پەلە بوو›.

**تعجیل کردن**: پەلەکردن؛ لەزکردن ‹اگر تعجیل نکنی از دستت می‌رود: ئەگەر پەلە نەکەی لە کیست دەچێ›.

**تعداد** / te'dād/: [عربی]/اسم. ژمارە؛ هەژمار؛ دەشە ‹تعداد گوسفندان را معلوم کنید: ژمارەی پەزەکان دیاری کەن›.

**تعدد** / ta'addod/: [عربی]/اسم. فرەیی؛ زۆری؛ دۆخ یان چۆنیەتی زۆر و جۆراوجۆر بوون.

▣ **تعدد زوجات**: چەند هاوسەری؛ چەن

ژنی؛ چن ژەنی.

**تعدی** / ta'addî، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. /ادبی/ دەستدرێژی؛ دەسدرێژی؛ دەزدرێژی؛ داگیرکاری؛ دەسخەری.

▣ تعدی کردن: دەسدرێژی کردن؛ خۆ کوتانە سەر دەسکەوت و ژیانی دیتران ‹به جان و مال مردم تعدی می‌کردند: دەست درێژیان دەکردە سەر ماڵ و گیانی خەلکی›.

**تعدیل** / ta'dîl/: [عربی]/اسم. ۱. کار یان ڕەوتی هاوسەنگ و هاوتاکردن ‹برای تعدیل قیمت‌ها اقدام کردیم: بۆ هاوسەنگ کردنی نرخەکان دەست بە کار بووین› ۲. /مجازی/ هەموارکاری؛ کار یان ڕەوتی هەموارکردن؛ کەمکردنەوە و لە شتێ گرتنەوە بە مەبەستی ڕێک و گونجاو بوونەوەی ‹تعدیل مالیات: هەموارکردنی پیتاک›.

▣ تعدیل ثروت: هەموارکاری ماڵ و دارایی؛ کار یان ڕەوتی ڕێک و هەموار کردنی سامانی کۆوە بوو لە لای دەوڵەمەندانەوە.

تعدیل مالیاتها: هەموارکردنی پیتاک؛ کار یان ڕەوتی هندکاندنی ڕادەی پیتاک.

**تعذیب** / ta'zîb/: [عربی]/اسم. /ادبی/ کاری ئازار و ئەشکەنجە پێدان؛ ئەشکەنجەکردن؛ گەهراندن؛ ئاراندن.

**تعذیر** / ta'zîr، ـات/: [عربی]/اسم. /ادبی/ کار یان ڕەوتی بڕ و بیانوو هێنانەوە؛ بیانک تاشین؛ ویانی یۆسەیوە.

**تعرض** / ta'arroz، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. /ادبی/ ۱. دەسدرێژی؛ پەلامار؛ کار یان ڕەوتی کوتانە سەر کەسێک بە مەبەستی ئێش و ئازارگەیاندن ‹تعرض به جان مردم؛ تعرض دشمن: دەسدرێژی بە سەر گیانی خەڵکدا؛ پەلاماری دوژمن› ۲. /قدیمی/ تووڕەیی؛ تۆپ و تەشەر ‹دیگری خرابکاری کرده به من تعرض می‌کنی؟: کەسێکی تر گەنەکاری کردووە بە سەر مندا تووڕەیی دەکەی؟›.

**تعرفه** / ta'refe، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. ڕیزنامە؛ ڕیزێ کە نرخی کالا، خزمەت، یا مافی کەس یان دابەشگەیەکی تێدا نووسراوە ‹تعرفه‌ی خدمات درمانی؛ تعرفه‌ی گمرکی: ڕیزنامەی خزمەتی دەرمانی؛ ڕیزنامەی گومرۆکی› ۲. بەرگی پێناسە.

**تعریض** / ta'rîz/: [عربی]/اسم. ۱. کار یان ڕەوتی پان کردنەوە؛ پانۆکردن؛ پانەوە کەردەی؛ پەرە پێدانی پانایی ‹جاده تعریض شد: ڕێگەکە پان کرایەوە› ۲. تەوس و توانج؛ پلار؛ تانێ؛ تەشەر؛ تەشەرە؛ زیپک؛ شاتاوال؛ سەرکۆنەی نەرێسات ‹در حرفهایش تعریض هم بود: لە قسەکانیدا تەوس و توانجیش هەبوو›.

**تعریف** / ta'rîf/: [عربی]/اسم. ۱. کار یان ڕەوتی ناساندن؛ پنە ئژناسەی ‹حرف تعریف: پیتی ناساندن› ۲. /ـها؛ ـات؛ تعاریف/ پێناس؛ پێناسە؛ قسەیەک بۆ ناساندنی شتێ یان کەسێک ‹تعریف اسب را بنویسید: پێناسەی ئەسپ بنووسن› ۳. /ـها/ /گفتاری/ تاریف؛ پەسن؛ ستایش؛ کار یان ڕەوتی پێدا هەڵگوتن؛ دەمدان ‹خیلی از شما تعریف کرد: زۆرێ ستایستانی کرد› ٤. /گفتاری/ گێڕانەوە؛ تاریف؛ کار یان ڕەوتی گوتنەوە؛ وتن؛ ڤەگۆین ‹از مسافرتت تعریف کن، چطور بود؟: لە سەفەرەکەت بگێڕەوە، چۆن بوو؟›.

▣ حرف تعریف ☜ **حرف**

**تعریفی** / ta'rîfî/: [عربی] صفت. /گفتاری/ ئەوتۆیی؛ شیاوی پێدا هەڵگوتن ‹زیاد تعریفی هم نبود: وا ئەوتۆیش نەبوو›. هەروەها: **تعریفی بودن**

**تعریق** / ta'rîq، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. کار یان ڕەوتی ئارەق‌کردن/ کەردەی؛ نەقتاندن؛ خوەدان؛ خوَ/ خیَ‌کردن ‹گرمای هوا باعث تعریق بیشتر می‌شود: گەرمای هەوا دەبێتە هۆی ئارەق‌کردنی زۆرتر›۲. ڕەوتی هەڵم دەرهاتن لە گیاگەلدا.

**تعزیت** / ta'ziyat/: [عربی]/اسم. [ادبی] پرسە؛ شینگێڕی؛ ئازیەت‌باری؛ تازیەباری.

**تعزیت‌نامه** / ta'ziyatnāme، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. [ادبی] شیوەن‌نامە؛ شین‌نامە؛ پرسەنامە.

**تعزیر** / ta'zîr، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ۱. [نامتداول] تەمێ؛ تەمبێ؛ کار یان ڕەوتی تاشاندن ۲. [فقه] کار و ڕەوتی تەمێ‌کردنی تاوانبار لە سەر تاوانێ کە لە شەرعدا سزای بۆ نەبڕاوەتەوە.

**تعزیه** / ta'ziye، ـها/: [عربی]/اسم. پرسە؛ پەرسە؛ تازیە؛ ئازیەتی؛ شینگێڕی؛ تازیەتی.

◘ تعزیه گرفتن: تازیەگرتن: ۱. شین‌گێڕی کردن ۲. پرسەنیان؛ پەرسە نیەی.

**تعزیه‌خوان** / ta'ziyexān، ـها؛ ـات/: [عربی/ فارسی]/اسم. شینگێڕ؛ چەمەری‌خوێن؛ کەسێ کە لە پرسەدا بەیت و باڵۆرە بە ئاهەنگەوە دەخوێنێ و خەڵک دێنێتە گریان.

**تعزیه‌خوانی** / ta'ziyexānî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. شینگێڕی؛ کار و ڕەوتی لاواندنەوە لە پرسەدا: **شبیه‌خوانی**

**تعزیه‌داری** / ta'ziyedārî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. شینگێڕی؛ کار و ڕەوتی پرسە نیان؛ پەرسە نیەی؛ تازیەگرتن.

**تعزیه‌گردان** / ta'ziyegardān، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. ۱. شینگێڕ؛ کارگێڕ یا بەڕێوەبەری ڕێوڕەسمی پرسە: **شبیه‌گردان** ۲. [تعریض] کتکەنەفتینە؛ ئاورخۆشکەرە؛ کەتن‌گێڕ؛ بشێونە؛ ئاژاوەگێڕ؛ ئاژاولەخۆشکەر؛ شێوەژنە ‹علیه استاندار تظاهرات راه انداخته بودند، آرام هم شده بود تعزیه‌گردان ماجرا: دژی پارێزگار خۆپیشاندانیان ساز دابوو، ئارامیش ببووە کتکەنەفتینەی کارەکە›.

**تعصب** / ta'assob، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ۱. ڕکە ‹تو از روی تعصب حرف می‌زنی: تۆ بە ڕکەوە قسە دەکەی› ۲. دڵ‌پێدانی زۆر و خۆشەویستی لە ڕادەبەدەر کە بەرچاو بگرێ.

**تعطیل**[1] / ta'tîl/: [عربی]/اسم. ۱. کار یان ڕەوتی ڕاوەستاندن یان کۆتایی هێنان بە کارێک؛ خەواندن؛ خەفاندن؛ وسنەی ‹تعطیل کار: خەفاندنی کار› ۲. /ـات/ بەتلانە؛ وچان؛ پشوودان؛ پشوودانی؛ بەتاڵی؛ بێکاری؛ پشوو؛ ڕۆژی کار نەکردن ۳. [کلام] بێ‌بڕوا بوون بە خودا.

**تعطیل**[2]: صفت. ۱. داخراو؛ بەستراو ‹کارخانه تعطیل است: کارخانە داخراوە› ۲. تایبەتمەندی کاتی بێکاری و پشوودان.

**تعطیلات** / ta'tîlāt/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **تعطیل** ۲. جمعِ ☜ **تعطیلی** ۳. پشوودان؛ ڕۆژ، حەفتە، مانگ یان وەرزی پشوودان ‹تعطیلات تابستانی: پشوودانی هاوینی›

◘ تعطیلات رسمی: پشوودانی ڕەسمی؛ کاتی پشوودان کە بە ڕەسمی لە لایەن خاوەن کار یان دەوڵەتەوە ناسرابێ.

تعطیلات فصلی: پشوودانی وەرزی؛ کاتی پشوو بە بۆنەی چاخێکی دیاریکراوەوە (وەک پشوودانی وەرزی جووتیاران، ماسیگران یان مامۆستایان).

**تعطیل‌بردار** / ta'tîlbardār/: [عربی/ فارسی] صفت. پشووهەڵگر ‹روزنامه تعطیل‌بردار نیست:

رۆژنامه بسته شد نیه›.

تعطیلی / ta'tîlî، ـها، تعطیلات/: [عربی]/اسم. پشوودان؛ کاتی دەس‌کێشان؛ چاخی (کات، ڕۆژ یان مانگ) دەست‌کێشان لـە کـار بـۆ کەسێ کە لە دامەزراوەیەکدا کار دەکـا ‹روز تعطیلی: ڕۆژی پشوو›.

تعظیم / ta'zîm/: [عربی]/اسم. ١. کڕنۆش؛ کوڕنوشت؛ کوڕنۆ؛ پانتە؛ سەرکۆپ؛ کاری داهاتنەوە و سەر دانەواندن بە نیشانەی ڕێزلێگرتن ‹آمد و بە مرد قدبلند تعظیم کرد: هات و بۆ پیاوە بالابەرزەکە کڕنۆشی برد› ٢. /ـها/ [نامتداول] ڕێزلێنان؛ بیرئانین.

تعفن / ta'affon/: [عربی]/اسم. [ادبی] گەنیاوی؛ گەنیاگی ‹بوی تعفن: بۆی گەنیاگی›.

تعفین / ta'fîn/: [عربی]/اسم. [قدیمی] ١. تەنتوور؛ تێکەڵی دەرمانێک لەگەڵ ئەلکولدا ‹تعفین ید: تەنتووری یود› ٢. گەنانـدن؛ بۆگەن‌کردن.

تعقل / ta'aqqol/: [عربی]/اسم. [ادبی] ١. مژیوەری؛ کار یان ڕەوتی کەڵک وەرگرتن لە ئاوەز، ژیری بە خەرج دان؛ ئاوەز خستنە کار ‹تعقل در هر کاری موجب سعادت است: ژیری لە هەر کارێکدا هۆی بەختەوەریە› ٢. ئاوەز؛ ژیری ‹این جور کارها با تعقل سازگار نیست: ئەم چەشنە کارانە لەگەڵ ئاوەزدا یەک ناگرنەوە›.

تعقلی / ta'aqqolî/: [عربی] صفت. مژیوەرانە؛ ژیرانە؛ پێوەندیدار بە بەڵگەی ئاوەزینەوە.

تعقیب / ta'qîb، ـها، ـات/: [عربی]/اسم. ١. کار و ڕەوتی لە شوێن‌گەڕان؛ بە دووداخولانەوە؛ شۆنیەرەگێڵەی ٢. شوێنگری؛ کار یان ڕەوتی شوێن‌کەوتن؛ شوێن هەڵکردن؛ شۆن هۆرکەردەی ‹رد پایش را تعقیب کردم: شوێن پێیم هەڵگرت› ٣. پەیجۆری؛ کار و ڕەوتی ڕاودۆنان؛ بە دوای شتێکدا چوون و پاپەی بوون؛ شۆنیەرەلوەی ‹در آنجا پروندەی مرا تعقیب کن، ببین کار به کجا رسیده: لەوێ پەیجۆری هەڤنویسەکەی من ببە، بزانە گەییشتۆتە کوێ›. هەروەها: **تعقیب شدن؛ تعقیب کردن**

◙ در تعقیب: بە شوێن؛ بە دوا؛ لە دوا؛ شۆنۆ؛ دماو ‹در تعقیب نامەی شما، من هم بە او تلفن زدم: بە شوێن نامەکەی تۆدا، منیش تەلەفوونم بۆکرد›.

تعقید / ta'qîd/: [عربی]/اسم. [ادبی] ئاڵۆزی؛ دژواری؛ پێچوپلووچی؛ نائاسایی و پڕگرێ و گۆڵ بوون (بەتایبەت لە نووسراوەدا).

تعلق / ta'alloq، ـات/: [عربی]/اسم. پێوەندی؛ پەیوەندی؛ پێ‌بەندی؛ بەندەواری؛ بەستەگی؛ بەسراوی؛ بەسراویەتی ‹از این همه تعلق گسستن، کار آسانی نیست: لەم گشتە پێوەندیانە پسان، کارێکی هاسان نیە›.

◙ تعلق خاطر: دڵبەندی؛ دڵبەستەیی؛ گیرۆدەیی؛ پابەندی؛ پێبەندی؛ هۆگریەتی ‹تعلق خاطر او بە مادرش بیش از حد بود: دڵبەندی بە دایکی لە ڕادە بەدەر بوو›.

◙ تعلق داشتن: هی کەسێک بوون؛ هینوو یۆی بیەی ‹کتاب بە او تعلق داشت: کتێبەکە هی ئەو بوو›.

تعلق گرفتن: پێ‌بڕیان؛ بە کەسێک بڕیان؛ بوون بە هی کەسێ؛ پنە بڕیەی ‹جایزه بە آزاد تعلق گرفت: خەڵاتەکە بە ئازاد بڕا›.

تعلقات / ta'alloqāt/: [عربی]/اسم. بەندەواری؛ پێبەندان؛ ئەوەی کە دەبێتە هۆی دڵبەستەیی یان هۆگریەتی.

◙ تعلقات دنیوی: ١. [مجازی] سامان؛ ماڵ و دارایی ٢. پێبەندانی دونیایی؛ پەیوەندیگەلی سەر بە ژیانی ئاسایی.

**تعلل** / ta'llol/: [عربی] *اسم. [ادبی]* سنەسن؛ سنگەسنگ؛ سس‌کاری؛ دەستی ــ دەستی؛ دەسی‌ــدەسی ‹در صورت تعلل در انجام وظیفه اخراج خواهد شد: ئەگەر لە جێبەجێ‌کردنی ئەرکیدا سنەسن بکا دەردەکرێ›.

**تعلم** / ta'allom/: [عربی] *اسم. [ادبی]* کار یان ڕەوتی فێر بوون/ بیەی؛ یادگرتن؛ هەڤۆتن.

**تعلیف** / ta'lîf/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ١. کار یان ڕەوتی لەوەڕاندنی چوارپێیان؛ چەرانی ئاژەڵان؛ لەوەڕنەی ‹تعلیف احشام در زمین غیر: لەوەڕی ماڵات لە زەوینی یەکی‌تردا› ٢. کار یان ڕەوتی لەوەڕان؛ لەوەڕین؛ لەوەڕیان؛ لەوەڕیەی؛ چەرین؛ چەڕین؛ ئالف خواردن ‹تخریب چراگاهها بر اثر تعلیف بی‌رویه: رووتیانەوەی لەوەڕگەکان بە هۆی لەوەڕانی لە ڕادەبەدەرەوە›.

**تعلیق** / ta'lîq/: [عربی] *اسم.* ١. دواکەوت؛ دۆخ یان چۆنیەتی پاش‌کەوتن و بێ‌ئەنجامانی کارێک ‹تعلیق انتخابات: دواکەوتنی هەڵبژاردن› ٢. *ـات/ [ادبی]* پەراوێز؛ پەیوەست: **تعلیقه** ٣. *[ادبی]* تەعلیق؛ شێوە نووسینێکی پیتی عەرەبی کە لە سەدەی شەشەمی کۆچیدا پەرەی سەند.

▣ **تعلیق به محال**: دانەپاڵی کارێک بە ئەنجامی شتێکەوە کە قەت ڕوو نادا (وەکوو: با گوڵێ بێتەو لە کانی!).

**تعلیق خدمت**: کار یان ڕەوتی بێکار کردنی کارمەندێک تا کاتی ڕوون بوونەوەی کارەکەی (کە ڕەنگە ببێتە هۆی هاتنەوەی بۆ سەر کار یا دەرکرانی یەکجاری).

**تعلیق مجازات**: ڕەوتی چاوپۆشی‌کردن لە سزادانی خەتابارێک تا کاتێ کە تاوانی‌تری لێ نەوەشاوەتەوە

**تعلیقه** / ta'lîqe/ ☜ **تعلیق ـ٢**

**تعلیقی** / ta'lîqî/: [عربی] *صفت.* وەدواخراو؛ پاشکەوتە.

**تعلیل** / ta'lîl/: [عربی] *اسم. [ادبی]* کار و ڕەوتی وەبیر خستنەوە؛ هۆ هێنانەوە؛ ویرەوە وسەی.

**تعلیم** / ta'lîm، ـها؛ ـات؛ تعالیم/: [عربی] *اسم.* ١. فێرکاری؛ هەوس؛ هەڤۆت؛ هووت ٢. کار یان ڕەوتی فێر بوون؛ یادگرتن ‹برای تعلیم نقاشی باید پیش استاد رفت: بۆ فێر بوونی شێوەکێشی دەبێ بچیە لای مامۆستا›.

▣ **تعلیم دادن**: فێرکردن؛ ڕاهێنان؛ هین کردن؛ هەوساندن؛ هۆژاندن؛ عاملاندن؛ هەڤۆتن؛ مستنایش؛ مسنانە ‹به او رانندگی تعلیم می‌داد: ڕانندەیی پێ فێر دەکرد›.

**تعلیم دیدن**: فێر بوون؛ ڕاهاتن؛ هەڤۆتن؛ هەوسین؛ وانە وەرگرتن ‹پیش برادرم تعلیم دیدم: لای براکەمەوە فێر بووم›.

**تعلیم یافتن**: فێر بوون؛ ڕاهاتن؛ هەڤۆتن؛ وەرگرتن ‹نواختن تار را نزد عبدالله‌خان تعلیم یافت: تارژەنی بە لای عەبدوڵلاخانەوە فێر بوو›.

**تعلیمات** / ta'lîmāt/: [عربی] *اسم.* فێرکاری.

▣ **تعلیمات ابتدایی**: فێرکاری سەرەتایی.

**تعلیمات اکابر**: فێرکاری گەورەساڵان.

**تعلیمات عالی**: فێرکاری باڵا.

**تعلیمات متوسطه**: فێرکاری ناوەندی.

**تعلیماتی** / ta'lîmātî/: [عربی] *صفت.* فێرکاری ‹دورەی تعلیماتی: خولی فێرکاری›.

**تعلیم‌وتربیت** / ta'lîm-o-tarbiyat/: [عربی] *اسم. [قدیمی]* ڕاهێنان و بارهێنان.

**تعلیم‌وتعلم** / ta'lîm-o-ta'allom/: [عربی] *اسم. [ادبی]* کار و ڕەوتی فێرکردن و فێربوون.

**تعلیمی** / ta'lîmî، ـها/: [عربی] *اسم.*

چێوتالیم؛ چێوێکی کورت و خەڕاتی کراو و ڕازاوە، کە ئەفسەران بە دەستیانەوە دەگرت.

**تعلیمی**[2]: *صفت*. پەروەردەیی؛ فێرکاری؛ سەر بە پەروەردەیی ‹شعر تعلیمی: هەڵبەستی پەروەردەیی›.

**تعلیم‌یافته** / ta'lîmyāfte /: [عربی/ فارسی] ☜ **آموزش‌دیده**

**تعمد** / ta'ammod /: [عربی]*اسم*. ئەنقەست؛ ئانقەست؛ دەسقەس؛ دەسەنقەست ‹از روی تعمد سر و صدا می‌کرد: بە ئانقەست هەرا و هوریای دەکرد›.

⊡ **تعمد داشتن**: بە ئەنقەست بوون؛ دەسەنقەسی و بە ویستی خۆ کارێ کردن.

**تعمدا** / ta'ammodan /: [عربی] *قید*. دەسانقەس؛ بە قەست؛ بە ئەنقەست؛ دەسقەس؛ ئانقەستی؛ قەسایقەس ‹تعمدا طوری چرخید کە بازویش بە سینی چای بخورد: بە ئەنقەست، جۆرێک هەڵگەڕایەوە کە باڵی بدا لە سینی چاییەکە›.

**تعمدی** / ta'ammodî /: [عربی] *صفت*. دەسقەسی؛ ئەنقەستی؛ ئەنقەسی.

**تعمق** / ta'ammoq، ـات /: [عربی]*اسم*. *[ادبی]* کار یا ڕەوتی تێفکرین؛ تێڕامان؛ هشاندن؛ بیرکردنەوەی ورد و هەمەلایەنە؛ تێدا ورد بوونەوە؛ تێدا بیرکردنەوە ‹باید در این بارە خوب تعمق کنیم: دەبێ لەم بارەوە باش تێفکرین›.

**تعمید** / ta'mîd /: [عربی]*اسم*. تەعمید؛ ڕێورەسمی تایبەتی بڕێک لە دینگەل (وەک خاچپەرستی) بۆ ئیمان پێهێنانی کەسێ کە لەگەڵ شۆردن یان نمایشتی شۆڕدنیدا هاوڕێیە.

⊡ غسل تعمید ☜ **غسل**

⊡ **تعمید دادن**: پاککردنەوە؛ شۆردن بە پێی ڕێورەسمی تایبەتی.

**تعمید یافتن**: پاک بوونەوە؛ شۆران بە ڕێورەسمی تایبەتی بڕێک لە دینگەل.

**تعمیر** / ta'mîr، ـها؛ ـات /: [عربی]*اسم*. کەڵتە؛ کار یان ڕەوتی چاککردنەوە؛ خاسەوکردن؛ خۆش کردنەوە؛ وەشەوەکەردەی ‹تعمیر یخچال خیلی هزینە دارد: چاککردنەوەی یەخچاڵ خەرجی زۆر دەبا›.

**تعمیرکار** / ta'mîrkār، ـها؛ ـان /: [عربی/ فارسی]*اسم*. چاکەوکار؛ وەشەوەکەر؛ وەستا؛ وۆسا؛ ئۆسا؛ کەسێ کە کاری چاکەوە کردن و دیسان خستنەوە کاری کەرەسەی خراو و لە کارکەوتووە.

**تعمیرگاه** / ta'mîrgāh، ـها /: [عربی/ فارسی] *اسم*. کارگەی چاکەوکاری؛ کارگەی تایبەت بە ساز و دروستکردنەوەی کەرەستەی خراپ و لە کارکەوتوو.

**تعمیری** / ta'mîrî، ـها /: [عربی] *صفت*. ١. چاکەوەکراو؛ شیاوی چاککردنەوە ‹یکی از رادیوها تعمیری است: یەکێک لە ڕادیۆکان چاکەوەکراوە› ٢. چاکەوکراو؛ خاسەوکریاگ؛ وەشەوەکریا.

**تعمیق** / ta'mîq /: [عربی]*اسم*. ١. *[نامتداول]* کار یا ڕەوتی قووڵکردنەوە/ کەردەیوە؛ کوورکردنەوە ‹تعمیق چاه نفت: قووڵکردنەوەی چاڵی نەوت› ٢. دابنارتن؛ کار یا ڕەوتی لە بن و ناخەوە دانان یا قووڵی پێدان ‹تعمیق حکومت قانون: دابنارتنی دەسەڵاتی قانوون› ٣. لە بنج و بناوانی شتێ کۆڵینەوە و دەرخستنی وردە و پردە شاردراوەکانی.

**تعمیم** / ta'mîm، ـها /: [عربی]*اسم*. *[ادبی]* ١. *[نامتداول]* کار یان ڕەوتی گشتیکردن؛ هەموانیکردنەوە؛ گشتیپێدانەوە ٢. کار یا ڕەوتی ڕەوا زانینی بڕیارێک لە بابەت

تــەواوی تــەوەرەکــانی هاوچــەشـــن یـــان ئەندامانی کۆمەڵێکەوە؛ گشتاندن.

**تعمیــــه** / ta'miye/: [عربــی]/اســم. *[بــدیع]* مــەتــەڵبێژی؛ وتــنی پــەیــڤێک بــە شــێوەی سەربەسراو و ئاوێتە بە مەتەڵۆکەوە.

**تعویــذ** / ta'vîz، ــهــا/: [عربــی]/اســم. *[ادبــی]* نوشــتوو؛ نووشــتە؛ نــشتوو؛ نــڤەشــت؛ نڤــشتی؛ نڤــشتۆک؛ نڤــشت؛ چــاوەزار؛ دوعــای نووســراو بــۆ پــارێزران لــە چاوچــڵە کــە ســێ ســووچ دەقی دەکەن و لــە بــەرگێکــی شــینی دەگــرن و هەمیشە لە خۆی هەڵدەواسن.

**تعــویض** / ta'vîz، ــهــا/: [عربی]/اســم. *[ادبــی]* ١. ئــاڵوگــۆڕ؛ ئــاڵوگــۆڕی؛ هــەڤگلی؛ کــار یــان ڕەوتی گـــۆڕین؛ گـــۆڕان؛ وارەی؛ وارتـــەی؛ واڕای؛ دانــانی شــتێ (زۆرتــر هاوچــەشــن) بــە جێــی شــتێکی دیکــە ‹تعـویض چرخ: گۆڕینــی چـــەرخ› ٢. واروگـــۆڕ؛ کـــار یـــان ڕەوتی گۆڕینــەوە؛ وەگــۆڕین؛ ئــەووارەی؛ گۆڕانــەوەی شتێ بە شــتێکیتــر ‹تعـویض خانە: گۆڕینەوەی ماڵ›.

**تعویـــق** / ta'vîq/: [عربـــی]/اســـم. دواکـــەوتی؛ دواخـــستی؛ دواخـــستنی؛ دۆخ یـــا چۆنیـــەتی دواکەوتنی کار یان ڕووداوێک.

▣ **بــه تعویــق افتــادن**: کــەوتنــە دواوە؛ دوا کــەفــتن؛ درەنــگ بــوون؛ کــەوتــەیــوە دمــا ‹آزمـون بـه تعویـق افتاد: ئـەزموونەکـە کـەوتـە دواوە›.

**بـه تعویـق انـداختن**: خـستنە دواوە؛ بـە دوا خستن؛ بەدرەنگا خـستن؛ وسـەیـەوە دمـاوە ‹دولـت انتخابـات را بـه تعویق انداخت: دەوڵـەت هەڵبژاردنەکەی خستە دواوە›.

**تعهــد** / ta'ahhod/: [عربــی]/اســم. وەخــۆگری؛ وەئەســتۆگری: ١. پــەیمــان؛ کــار یــا ڕەوتی وە ئــەســتۆگرتنی کارێــک ‹تعهد کـردن: وەئـەسـتۆ گــرتن› ٢. /ــهــا؛ ــات/ بــەڵــێن؛ ئــەوەی کــە وەئــەســتۆ دەگــیردرێ یــان کــەســێک بــە ئــەرکــی خــۆی دەزانــێ ئــەنجــامی بــدا ‹تعهد شغلی: بەڵێنی کاری پیشەیی›.

▣ **تعهــد اخلاقــی**: وەخـــۆگری ئاکـــاری؛ ڕەوتێـــک کـــە بـــە پێـــی داب و نـــەریـــتی ســـەلمـاو، کـــەســێک بـــەڕێـــوە بـــردنی بـــە ئەرکی سەرشانی خۆی دەزانێ.

▣ **تعهــد دادن**: *[گفتــاری]* بـــەڵـــێندان؛ بـــڕیاردان؛ قـــەراردان؛ قـــەوڵدان؛ وەئــەســتۆ گــرتن بــەتایبــەت لــە لای کاربــەدەســتێکی ڕەسمیــەوە ‹تعهد داد که دیگـر دیـر نکـند: بەڵێنی دا ئیدی درەنگ نەکا›.

**تعهد کـردن**: بـڕیاردان؛ وەسـتۆگرتن؛ وەخـۆ گــرتن ‹تعهد کرد کـه تـا فـردا پـول را بپـردازد: بڕیاری دا تا بەیانی پارەکە بدا›.

**تعهــد گــرفتن**: بــڕیار وەرگــرتن؛ بــەڵــێن سەندن ‹از او تعهد گرفتم کـه تـا یـک هفتـه کـار را تمام کند: بەڵێنم لێ وەرگرت تـا حـەفتـەیـەک کارەکە تەواوکا›.

**تعهدنامـــــه** / ta'ahhodnāme، ــهــا/: [عربـــی/ فارســی]/اسـم. بــەڵــێننامــە؛ نووســراوەیــەک کــە ئــەنجامــدانی کارێــک یــان چــاو بــڕین لــە ئاکــارێکی تێیــدا وەئــەســتۆ گــیراوە ‹تعهدنامه گرفتند و آزادم کردند: بەڵێننامەیان لـێم سـەنـد و ئازادیان‌کردم›.

**تعــیش** / ta'ayyoš/: [عربــی]/اســم. *[نامتــداول]* ١. خـــۆشبـــوێری؛ وەشـــبـەری ٢. ڕابـــواری؛ گوزەران؛ کار یـان ڕەوتی قـەرقـەدانـدن؛ ژیـان بردنە سەر.

**تعـــین** / ta'ayyon، ــهــا؛ ــات/: [عربــی]/اســم. *[نامتــداول]* شــکۆ؛ شــانوشــکۆ؛ شــانوشــۆن؛ گەورەیی؛ پایەبەرزی؛ مەزنایەتی.

▣ **تعین یـافتن**: شــان و شــۆن پــەیــداکردن؛ شــان و شــکۆ پــەیــداکردن؛ بــە شــان و شــۆ گەیشتن؛ پایەبەرز بوونەوە.

**تعیین** / ta'yîn/: [عربی]/اسم. ۱. کار یا ڕەوتی دیاری‌کردن و شاندان ‹میزان کار را تعیین کنید: ڕادەی کارەکە دیاری کەن› ۲. کار یان ڕەوتی دانان؛ دانیان؛ دامەزراندن ‹تا تعیین مسئول جدید، شما بمانید: تا دانانی بەرپرسی نوێ، ئێوە بمێننەوە›.

▣ تعیین شدن: ۱. دیاری‌کران ۲. دانران.

هەروەها: **تعیین کردن**

**تغابن** / taqābon/: [عربی]/اسم. ۱. *[ادبی]* خەڵەتاوی؛ تێشکان و هەست بە زیان و دۆڕان‌کردن ۲. تەغابون؛ ناوی سوورەی شەست و چوارەم لە قورعانی پیرۆز.

**تغار** / taqār، ـها/: [ترکی]/اسم. ۱. تەخاراو؛ تەغار؛ دەفرێکی سواڵەتی (زۆرتر) بە دەمی ئاوەلا و بنی تا ڕادەیەک بچووکەوە ۲. *[قدیمی]* تەخار؛ تەغار؛ پێوانەیەک بەرامبەر بە ۵ تەنەکە، یان ۸۳,٤ کیلۆگرەم ۳. *[تعریض]* کادان؛ هۆڵدان؛ ئەشقەمە؛ ورگ؛ زگ؛ زک؛ سک؛ لەمە ‹چقدر می‌خوری! هنوز تغارت پر نشده: چەندە دەخۆی! هێشتا کادانەکەت پڕ نەبووە› ٤. *[مجازی]* زار؛ دەم؛ دم؛ دەڤ ‹آن تغار گندەات را ببند که دیگر حوصلەی حرفهایت را ندارم: ئەو زارە دڕاوەتە ببەسە ئیتر تاقەتی قسەکانتم نیە›.

**تغافل** / taqāfol/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کار یا ڕەوتی خۆ خافڵاندن؛ خۆ لە نەزانی‌دان؛ خۆ لە گێلی دان؛ خۆ گێل کردن؛ خۆ بێ‌خەوەرکردن؛ خۆ بێ‌خەوەر پیشاندان و شتێ لە بەرچاو نەگرتن.

**تغذیه** / taqziye/: [عربی]/اسم. ۱. کار و ڕەوتی خواردن؛ واردەی؛ واردش؛ خۆراک خواردن ‹او روش تغذیەی صحیح را بە فرزندش آموختە بود: ڕێگەی دروست خواردنی بە منداڵەکەی فێرکردبوو› ۲. *[مجازی]* خۆراک؛ بژیو؛ کار یان ڕەوتی وەرگرتنی پێداویستی بۆ درێژە پێدان بە کار و تێکۆشان ‹تغذیە فکری: خۆراکی فیکری› ۳. *[مجازی]* کار یان ڕەوتی خۆراکدان؛ هێز و توانا دان بە کەسێ یان شتێک و نیازی ئەو دابین کردن.

▣ تغذیە شدن: بژیو پێگەیشتن؛ خۆراک پێگەیشتن؛ وەرگرتنی خواردەمەنی یان پێداویستی‌تری ژیان.

تغذیە کردن: خۆراکدان؛ بژیو پێگەیاندن؛ خورادەمەنی پێدان؛ خواردەمەنی یان پێداویستی دان.

**تغزل** / taqazzol، ـات/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کار یان ڕەوتی هەڵبەستن و خوێندنی شیعری دڵداری؛ هەڵگوتن؛ غەزەڵ‌گوتن.

**تغزلی** / taqazzolî/: [عربی] صفت. *[ادبی]* ئەویندارێتی؛ ئەویندارانە ‹شعر تغزلی: هەڵبەستی ئەویندارانە›.

**تغلیظ** / taqlîz/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی خەستەوکردن؛ خەس‌کردنەوە؛ هەسەو کردن؛ هەسەوەکەردەی ۲. *[مجازی، قدیمی]* ڕووگرژی؛ ناوچاوتاڵی؛ زمان‌تاڵی؛ گەمۆری.

**تغیر** / taqayyor/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* تووڕەیی؛ توندی؛ هەڵچوویی؛ کار یان ڕەوتی هەڵشاخان؛ هۆڕئامەی ‹چرا با تغیر با من حرف می‌زنی: بۆ بە تووڕەییەوە ئەمدوێنی›.

**تغییر** / taqyîr، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. گوهار؛ کار یان ڕەوتی گۆڕان؛ گۆڕیان؛ وارپەی؛ فارپای ‹تغییر اوضاع: گۆڕانی بار و دۆخ›.

▣ تغییر ذائقە: تامی دەم گۆڕان؛ گۆڕانی تامی زار بە خواردن یان خواردنەوەی شتێک.

▣ تغییر دادن: گۆڕان؛ گۆڕین؛ گوهارتن؛ واڕەی؛ واڕتەی؛ گوهەڕین؛ گوهەڕاندن ‹شما بعضی جملەها را تغییر دادەاید: ئێوە بڕێ لە ڕستەکانتان گۆڕاوە›.

**تغییر کردن/ یافتن:** گۆڕان؛ گۆڕیان؛ گۆڕدران؛ واریەی؛ فاریای؛ گوهەران ‹رنگش تغییر کرد: ڕەنگی گۆرا›.

**تف / taf:** /اسم. ۱. شەرا؛ سەبوون؛ تاو؛ تاوە؛ تین؛ تینی؛ هیت ‹تف خورشید: شەرای هەتاو›: **تفت** ۲. گەرما؛ گڕ ‹تف معده: گەرمای گەدە› ۳. [مجازی] ئاگر؛ گڕ؛ دەرد و ژان.

**تف ۱ / tof:** /اسم. [گفتاری] تف؛ گلۆیز؛ ئاودەم.

▣ **تف سر بالا:** [کنایی] تفی بەرەو با/ ژوور؛ تف سەرەو ژوور؛ گلۆیزوو سەرەکۆی؛ دژمنایەتی یان تۆڵە سەندنەوەیەک کە زیان و زەرەرەکەی داوێنی تۆڵەسێنەر بگریتەوە.

▣ **تف کردن:** ۱. تف‌کردنەوە؛ تفەوکردن؛ فتاندن؛ ئەوەتفەی؛ تفایوە؛ تف هاویشتن؛ تووڕدان یان داخستنی ئاوی دەم. هەروەها: **تف انداختن** ۲. تفاندنەوە؛ تفانەوە؛ لە زار دەرهاویشتن یان تووڕدانی شتێ کە بۆ خواردن نابێ.

**تف ۲:** صوت. تف؛ وتەیەک بۆ دەربڕینی ڕق و قین ‹تف به این زندگی که برای ما درست کردەاند: تف لەم ژینە کە بۆ ئێمەیان سازکردووە›.

**تفاخر / tafāxor:** [عربی]/اسم. [ادبی] بەخ؛ بەخی؛ کار یان ڕەوتی خۆ هەلکێشان؛ غللووری کردن؛ یەرغە بوون ‹تفاخر به نیاکان مشکل ما را حل نمی‌کند: بەخ بە پێشینینان کێشەمان چارەسەر ناکات›.

**تفاسیر / tafāsîr:** [عربی] جمعِ ☜ **تفسیر**

**تفاصیل / tafāsîl:** [عربی] جمعِ ☜ **تفصیل**

**تفاضل / tafāzol:** [عربی]/اسم. ۱. هەڤیازی ۲. [ریاضی] پاشماوە؛ ئەوەمەنە.

**تفأل / tafa'ol:** [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی دەم کتێوکردنەوە؛ لای کتێو ڕوانین؛ فاڵ گرتنەوە.

**تفالە / tofāle:** [عربی]/اسم. تلف؛ تلفە؛ تلفار؛ تلفارە؛ تۆفاڵ؛ تلپە؛ تلپ؛ تلتە؛ لیتە؛ لیرد؛ سلپ؛ سلف؛ خلتە؛ ملت؛ ملتە: ۱. بەشی پاشماوەی ماکێک کە شیرە، ڕۆن یان ئاوەکەی لێ وەرگیراوە ‹تفالەی انگور؛ تفالەی چای: سنەی تری؛ سنەی چای› ۲. [مجازی] شت یان کەسی پەست و بێ‌نرخ ‹تفالەهای اشغالگران: سفارەکانی داگیرکەران›.

**تفاوت / tafāvot:** [عربی]/اسم. جیاوازی؛ جیایی؛ جودایی؛ تەوفیر؛ تۆفیر؛ فەرق؛ نابەرانبەری لەگەڵ شتێکی‌تردا لە بواری چۆنیەتی، ڕەنگ، بیچم، هەند و ئەندازەوە ‹رنگ این با آن یکی تفاوت دارد: ڕەنگی ئەمە لە گەڵ ئەوەدا جیاوازی هەیە›.

▣ **تفاوت معنی‌دار:** جیاوازی بەرچاو؛ جیاوازیەک (کەم یان زۆر بوونەوەیێک) کە نیشاندەری کار و ڕەوتێکی تایبەتیە.

**تفاهم / tafāhom:** [عربی]/اسم. ۱. /ها؛ ات/ کار یان ڕەوتێک بۆ دەرکەوتنی بیر، باوەڕ، سەلیقە، ئاکار یان ئەنگیزەگەلی کەسێکی‌تر و ڕێک و یەک‌لا بوونەوە لەگەڵی؛ لێک‌گەیشتن؛ لێگەیشتن ‹بدون تفاهم کارشان پیش نمی‌رود: بەبێ لێک‌گەیشتن کاریان بەرێوە ناچێ› ۲. [مجازی] سازشت؛ کار یان ڕەوتی پێک‌هاتن؛ سازان؛ ساچیان؛ ساچیەی؛ لەڤ هاتن ‹با هم تفاهم دارند: پێکەوە سازسیان هەیە›. هەروەها: **تفاهم داشتن؛ به تفاهم رسیدن**

**تفاهم‌نامە / tafāhomnāme:** [عربی/ فارسی] /اسم. پێکهات‌نامە؛ سازشت‌نامە؛ نووسراوەیێ کە ئەوانەی ئیمزایان کردووە لە سەر ئەو بابەتانەی تێیدا هاتووە، پێک‌هاتنی خۆیان ڕادەگەینن (تا لەوە دوا وەکوو بڕیار یان

پێکهاتێک بلاو بێتەوە».

تفت / taft/: اسم. [گفتاری] تاو؛ تاوە؛ تین؛ تینی؛ هیت: تف

▣ تفت دادن: تاودان؛ سوورەوەکردن؛ چۆقاندن؛ گەرما دان بە شتێ تا ڕادەیەک کە ڕەنگی تۆزێک مەیلەو سوور بێتەوە «گوشت را کمی تفت می‌دهیم: گۆشتەکە نەختێ تاو دەدەین».

تفتال / taftāl/: [؟] اسم. [زمین‌شناسی] تەفتال؛ ماکێکی سیلیسی و تواوەی نێو ناخی زەوین کە سەرچاوەی بەردی ئاگرینە: ماگما

تفتگی / taftegî/: اسم. تاودراوی؛ دۆخ یا چۆنیەتی هێندێک تین پێدان بەلام نەک تەواو.

تفته / tafte/: صفت. تاودراو؛ تین‌پێدراو «آهن تفته: ئاسنی تاودراو».

تفتیش / taftîš، ـها/: [عربی] اسم. کار یان ڕەوتی پشکنین؛ بوشکنین: ١. قەلۆ؛ سەنگ‌وسۆزن؛ سەچت؛ مالجور؛ کار و ڕەوتی گەڕان؛ وشکنەی؛ گێلەی؛ ورد بوونەوە و گەڕان بە شوێن شتێکدا «تفتیش منزل: پشکنینی مال» ٢. [نامتداول] پرس و جۆ «تفتیش عقاید: پشکنینی بیر و ڕا»

▣ تفتیش بدنی: پشکنینی لەش؛ گەڕان بە جلک و لەشی کەسێکدا.

تفتیش عقاید: پشکنینی بیر و ڕا؛ پرس و جۆکردن بۆ زانینی بیر و بۆچوونی خەلک و ناسینەوەی نەیاران.

▣ تفتیش کردن: پشکنین؛ سەچتین؛ قەلۆ کردن؛ لێ‌گەڕان؛ وشکنەی؛ چنەگێلەی؛ گەردین.

تفتین / taftîn/: [عربی] اسم. [قدیمی] بشێونەیی؛ شێوانکاری؛ ئاژاوەگێری؛ پیلانگێڕی؛ کاری ئاژاوە نانەوە.

تفحص / tafahhos، ـها؛ ـات/: [عربی] اسم. [ادبی] کار یان ڕەوتی تۆژینەوە؛ لێکۆڵینەوە؛ وردگەڕان؛ هلکەوشاندن؛ هلکەواشتن «تفحص برای یافتن شخص فراری ادامه دارد: تۆژینەوە بۆ دۆزینەوەی کابرای هەلاتوو هەروا بەردەوامە».

تفرج / tafarroc/: [عربی] اسم. [ادبی] سەیران؛ گەشت‌وگێل؛ گەڕان لە دەشت و دەر بۆ حەسانەوە و خەم ڕەواندن.

تفرجگاه / tafarrocgāh، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. سەیرانگا؛ جێگەی گەشت و سەیران لە ژینگەدا.

تفرعن / tafar'on/: [عربی] اسم. [ادبی] لووت‌بەرزی؛ دەماربەرزی؛ خۆ بە زل زانی؛ خۆپەسێنی؛ ئاکاری سەر هەلداو لە هەستی خۆ بە زلتر زانین و خەلک بە کەم دانانەوە.

تفرق / tafarroq/: [عربی] اسم. [ادبی] بلاوەیی؛ پرژ و بلاوی؛ پەرژاویەتی.

تفرقه / tafraqe, tafreqe، ـها/: [عربی] اسم. ١. بلاوی؛ بلاوەیی؛ پەرژ؛ بار و دۆخی دەست لە یەک براوی و لێک‌جیایی لە شتێکدا «تفرقەی حواس: بیر بلاوی» ٢. چەن‌بەرەکی؛ چەن‌دەسەیی؛ دووبەرەکی؛ دووبرەکی؛ دووبەرەکایەتی؛ چەن‌پەلی «تفرقه در میان اعضا موجب برهم خوردن جلسه شد: چەن‌بەرەکی لە نێو ئەندامانەدا بوو بە هۆی هەلوەشانەوەی دانیشتنەکە».

▣ تفرقەی حواس: بیربلاوی؛ بیرئالۆزی.

تفرقەی خاطر: خاتر پەرێشانی؛ بیرپەرتی؛ بیربلاوی؛ بیرشاشی.

▣ تفرقه افتادن: دووبەرەکی ساز بوون؛ جیایی‌کەوتن/ کەوتنەوە؛ چەن‌بەرەکی داکەوتن «در میان اعضا تفرقه افتاد: چەن‌بەرەکی کەوتە نێوان ئەندامانەوە».

**تفرقە انداختن:** دووبەرەکی نانەوە؛ دووبەرەکی خۆش کردن؛ جیایی خستن ‹تفرقە بیانداز و حکومت کن!: دووبەرەکی بنەوە و ئاغا بمێنەوە!›.

**تفرقەانگیز** / tafraqe'angîz, tafreqe- /: [عربی/ فارسی] *صفت*. بشێونە؛ بشێوەکار؛ بشێون؛ شێوەژنە؛ ئاژاوەگێڕ؛ هۆی چەند دەستەیی، دووبەرەکی و جیایی.

**تفریح** / tafrîh، ـها؛ ـات/: [عربی]*اسم*. سەیران؛ گەشت؛ گەشتوگوزار؛ خڕ؛ گێڵەی؛ چالاکیەک کە دەبێتە هۆی سەرگەرمی، ڕابواردنی کات بە خۆشی و دوور خستنەوەی کوڵوکەسەر.

▣ **تفریح سالم:** شادیەک کە لەگەڵ نەریتەکانی کۆمەڵگادا سازگار بێت.

**زنگ تفریح** ☜ **زنگ**

▣ **تفریح داشتن:** خۆش بوون؛ بوونە هۆی سەرگەرمی؛ سەیر بوون ‹کارهایش خیلی تفریح داشت: کارەکانی زۆر خۆش بوون›.

**تفریح کردن:** سەیران کردن؛ گێژ خواردن؛ گێل خواردن؛ بە دڵخوازی خۆ، کات ڕابواردن.

**تفریحی** / tafrîhî/: [عربی] *صفت*. خۆش؛ سەرگەرمکەر ‹فیلم تفریحی: فیلمی خۆش›.

**تفریط** / tafrît، ـها/: [عربی]*اسم*. *[ادبی]* کۆتایی؛ کەمتەرخەمی؛ کار یان ڕەوتی پێداگرتن لەسەر کەم. بەرانبەر: **افراط**

▣ **تفریط کردن:** کۆتایی کردن؛ ماڵ (بەتایبەت هی کەسانیتر) بە فیڕۆ دان.

**تفریق** / tafrîq، ـها/: [عربی]*اسم*. ١. *[ریاضی]* یەکێک لە چوار کارە سەرەکیەکان کە جیاوازی دوو هەند بە گوێرەی یەکتری پێ دیاری دەکرێ ٢. *[نامتداول]* جوێکری؛ لێکبڕی، جیاسازی.

**تفسیدن** / tafsîdan /: *مصدر. لازم.* //**تفسیدن:** پرووزای؛ **میتفسی:** دەپرووزی؛ **بتفس:** بپرووزە// ١. پرووزان؛ پرووزیای؛ تەوەسیان؛ پیشیان؛ پلیشیان؛ پلمیشیەی؛ لە بەر تاوی گەرمای سەختەوە بوون ٢. *[فیزیک]* قرچیان؛ هەڵقرچان؛ ئەوەقرچیەی؛ قرچیای؛ پلخواردنی تنۆکەی تراو لە سەر ڕوویەکی زۆر داخدا و بوون بە هەڵم بەبێ کوڵان.

■ صفت مفعولی: **تفسیده** (پرووزاو)

**تفسیر** / tafsîr، ـها؛ ـات؛ تفاسیر/: [عربی]*اسم*. ئازەنتی؛ ڕاوە؛ ڕاڤە؛ ڕاژە؛ واتا لێکدانەوە؛ شیکردنەوە: ١. کار یان ڕەوتی ڕوون کردنەوەی واتا و مەبەستی نووسراوە یان وتەیەک و هۆی پەیدا بوون و مرازی نووسەر یان بێژەر ‹تفسیر قرآن: ڕاڤەی قورعان› ٢. وتە یان نووسراوەیەک کە ئاوەها مەبەستێکی هەیە و بۆ شی کردنەوەی شتێک نووسراوە.

▣ **تفسیر سیاسی:** ڕاڤەی ڕامیاری؛ شی کردنەوەی هۆی ڕووداوە ڕامیاریەکان و پێش بینی بۆ داهاتوو. هەروەها: **تفسیر اقتصادی؛ تفسیر نظامی**

**تفصیل** / tafsîl، ـها؛ ـات؛ تفاصیل/: [عربی]*اسم*. *[ادبی]* کار یان ڕەوتی گوتنی پاژ بە پاژی بابەتێک بە دوور و درێژی.

▣ **تفصیل دادن:** بە وردی و دوور و درێژییەوە لێدوان.

**تفصیلی** / tafsîlî/: [عربی] *صفت*. دوور و درێژ؛ بە هەموو وردەکاریەکەوە.

**تفضل** / tafazzol، ـات/: [عربی]*اسم*. *[ادبی]* ١. چاکە؛ خاسە؛ باشی ٢. دلۆڤانی؛ میهرەبانی؛ مەیرەوانی.

▣ **تفضل کردن:** چاکە لەگەڵ کردن؛ دلۆڤانی کردن؛ لە ڕووی میهرەبانی و دلۆڤانیەوە شتێک دان ‹خداوند تفضل کرد

ما را از آن مخمصه نجات داد: خودا ... و لەو فەرتەنە پەڕاندینیەوە›.

تفضیل / tafzîl/: [عربی]/اسم. [ادبی] هەڤیازی؛ دۆخی لە سەرتر، گەورەتر یان باشتر بوون.

تفضیلی / tafzîlî/: [عربی]/اسم. خاوەن هەڤیازی.

◙ صفت تفضیلی ☜ **صفت**

تفقد / tafaqqod، ـات/: [عربی]/اسم. دڵنەوایی؛ دڵجۆیی؛ دلۆڤانی؛ کار یان ڕەوتی بە سەرکردنەوە ‹شاهزاده خانم از سر تفقد سری تکان داد: شازادە خاتوون لە ڕووی ...ەوە سەرێکی لەقاند›.

تفک / tofak/: اسم. ۱. ☜ **پفک-۱** ۲. تاپڕ؛ تاپەڕ؛ تفەنگی ساچمەزەن.

تفکر / tafakkor، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ۱. سیفا؛ کار یان ڕەوتی تێفکرین؛ بیرکردنەوە؛ تێڕامان؛ هشاندن؛ ویرەوەکەردەی ‹مدتی به تفکر پرداخت: ماوەیەک تێفکری› ۲. هزر؛ بۆچوون؛ شێوازی بیرکردنەوە ‹تفکر سیاسی: هزری ڕامیاری›.

تفکیک / tafkîk/: [عربی]/اسم. جیاکاری؛ جوێکاری؛ کار یان ڕەوتی جوێ‌کردنەوە؛ جیاکردنەوە؛ لێک‌کردنەوە؛ لێک جیا کردنەوە؛ جیاوەکەردەی ‹تفکیک نامەها بە عهدەی شما: جیاکردنەوەی نامەکان لە ئەستۆی ئێوە بێ›.

◙ تفکیک قوا: جیاکردنەوەی هێزەکان؛ یەکێک لە پێویستەکانی ولاتداری ئەمرۆژینەیە، کە دەبێ سێ هێزی قانووندانەر و بەڕێوەبەر و داوەری کار، ئەرک و ئیشیان بە ڕۆشنی لێک جیاواز بێ.

تفمالی / tofmālî/: اسم. ۱. تفمالی؛ تفساوی؛ کار یا ڕەوتی ساوینی ئاوی دەم بەسەر شتێکدا ‹در پاکت را تفمالی کرد و چسباند: دەرکی پاکەتەکەی تفمالی کرد و چەسپاندی› ۲. [مجازی] پشیلەشۆر؛ پشی‌شۆر؛ سەرچڵ؛ کار یا ڕەوتی جێبەجێ کردنی کارێک بە شێوەی سەرسەری و ناتەواو ‹کاسەها را تفمالی کردە و رفتە: قاپەکانی پشیلەشۆر کردووە و ڕۆیشتووە›.

**تفنگ** / tofang، ـها/: اسم. بەرووج؛ تفەنگ؛ تفەک: ۱. ئامرازێکی تیر هاویشتنی تاکەکەسی لوولە درێژی قۆناخدارە ۲. چەک؛ گولەهاوێژی شەڕ ۳. هەر ئامرازێک لە بیچمی تفەنگ بۆ سەمپاشی و...

◙ تفنگ بادی: تفەنگ بادی؛ چەکی بایی؛ بەرووەجی بایی.

تفنگ پر: تفەنگی پڕ؛ بەرووەجێ کە گوللەی تێدایە. هەروەها: **تفنگ خالی**

تفنگ تە پر: تاپڕ؛ تاپەڕ؛ بەلەمبڕ؛ تفەنگێ کە لە بنەوە باروت و گوللەی تێ بخرێ. هەروەها: **تفنگ سرپُر**

تفنگ خودکار: چەکی خۆمەش؛ تفەنگێ کە بە چرکاندنی پەلەپیتکە، گوللەگەلێکی زۆر، بەریز دەتەقێنەوە.

تفنگ دولول: چەکی دوولوول؛ جفت لوول؛ جۆرێک تفەنگە کە دوو لوولەی لە هێلێک و لە پەنای یەکتردا هەیە، بۆ تەقاندنی دوو تیر بە شوێن یەکدا.

تفنگ ساچمەای: شرقە؛ قرمە؛ ڕەشۆکی؛ جۆرێک تفەنگی ڕاوە کە بە جێی تاقەگوللە، هێندێک ساچمەی تێدا یە.

تفنگ شکاری: چەکی ڕاو؛ تفەنگی تایبەتی ڕاو.

تفنگ نیمە خودکار: چەکی نیوەخۆمەش؛ تفەنگێ کە بە چرکاندنی پەلەپیتکە و دەرچوونی گوللە، گوللەیێکی‌تر دەچێتە بەرکار.

⊡ **تفنگ انداختن:** *[گفتاری]* گولله تەقاندن؛ تیر هاویشتن؛ تفەنگ تەقاندن.
**تفنگ درکردن:** تیر هاویشتن؛ گولله تەقاندن؛ تیر دەرکردن؛ گولله خستن؛ تیر خلاس‌کردن؛ گرۆڵیە تەقنەی؛ تیر شای.

**تفنگچی** / tofangčî/ ☜ **تفنگدار**

**تفنگدار** / tofangdār، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* چەکدار؛ تفەنگدار؛ تفەنگچی؛ شەڕکەری بە تفەنگ: **تفنگچی**

⊡ **تفنگدار دریایی:** چەکداری زەریایی؛ چەکداری فێرکراوی هێزی زەریایی بۆ شەڕ.

**تفنن** / tafannon، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* سەرگەرمی؛ کارێک بۆ سەرگەرمی و خۆش ڕابواردن نەک بە شوغڵ؛ خۆخەڵەنجان؛ وێخەجڵنەی ‹برای تفنن مدتی بە گلکاری پرداخت: بۆ سەرگەرمی ماوەیەک خەریکی گولکاری بوو›.

**تفننی**[1] / tafannonî/: [عربی] *صفت.* بە دۆخ یان چۆنیەتی سەرگەرمیەوە.

**تفننی**[2]: *قید.* وەک سەرگەرمی؛ بۆ سەرگەرمی؛ بە مەبەستی خۆ خلافاندن یان وەک سەرگەرمی ‹آزاد تفننی درس می‌خواند: ئازاد وەک سەرگەرمی دەرس دەخوێنێ›.

**تفو** / tofû/: *صوت.* *[ادبی]* تف؛ تفکە؛ عەک تف؛ دەک تف؛ وشەی دەربڕینی بێزاری و وەڕەزی ‹تفو بر تو ای چرخ گردون! تفو: تف لە رووت ئەی چەرخی گەردوون! تف لە رووت!›.

**تفوق** / tafavvoq/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* هەڤیازی؛ سەرکەوتوویی؛ زاڵیەتی؛ بالادەستی ‹علل تفوق غرب: هۆی هەڤیازی ڕۆژئاوا›.

⊡ **تفوق جستن:** پێشەک ساندن؛ پێش گرتن/ کەوتن؛ هەڤیازی بە دەستهێنان ‹پس از مدتی نیروهای متفقین بر نیروهای متحدین تفوق جستند: پاش ماوەیەک هێزە هاوپەیمانەکان پێشەکیان لە هێزە یەکگرتووەکان ساند›.
**تفوق داشتن:** زاڵ بوون؛ هەڤیاز بوون؛ لە پێشەوە بوون ‹در آغاز جنگ آلمان بر متفقین تفوق داشت: لە دەسپێکی شەڕدا ئاڵمان بە سەر هێزە هاوپەیمانەکانەوە زاڵ بوو›.
**تفوق یافتن:** کەوتنە بەر؛ کەوتنە پێشەوە؛ زاڵ بوون؛ سەرکەوتن.

**تفویض** / tafvîz/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* ١. کار یان ڕەوتی پێ‌سپاردن؛ پێدان؛ دانە دەست ‹تفویض اختیار: پێ‌سپاردنی دەسەڵات› ٢. *[فلسفه]* ئازادی ویستی مرۆڤ. بەرانبەر: **جبر**

⊡ **تفویض کردن:** سپاردن؛ دانە دەست ‹وزیر کشور اختیارات خود را در استانها بە استانداران تفویض کرد: وەزیری وڵات دەسەڵاتی خۆی لە پارێزگاکاندا بە پارێزگەرەکان سپارد›.

**تفهیم** / tafhîm/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* کار یا ڕەوتی تێگەیاندن؛ فاماندن.

⊡ **تفهیم شدن:** تێگەیندران ‹موضوع شکایت بە متهم تفهیم شد: تاوانیەکە لە بابەتی شکایەتەکەوە تێگەیندرا›.
**تفهیم کردن:** تێگەیاندن؛ فاماندن؛ قەوراندن؛ نیشاندان؛ بردنە مێشکەوە؛ چنەیاونەی؛ ڕوون‌کردنەوەی مەبەستێک ‹ بە او تفهیم کردم کە ... : تێم‌گەیاند کە...›.

**تق** / taq(q)/: *صوت.* تەق؛ تەقە؛ پۆقە؛ دەنگی گڕ و کەمبڕی تەقانەوە (وەکوو تەقینەوەی گوللە، ترەکینی تەگەرەی ترۆمبێل و...).

⊡ **تق چیزی در آمدن:** *[گفتاری]* بە فشە

دەرچـــوونی شـــتێک؛ نـــاوی شـــتێک زڕان؛ دەرکـەوتـنی ڕاسـتەقانیـەک کـە شـاردراوە یـان شـاراوەیە؛ بـەتـاڵ و بـێ‌متمانـە بـوون ‹تـق شـرکت درامـد: بـەشـدارگەکـە بـە فـشـە دەرچوو›.

**تقابل** / taqābol، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. [ادبـی] ١. [نامتـداول] ڕووبـەڕوویـی؛ ڕواوڕوویـی؛ هـەڤبەری؛ دۆخـی لـە بـەرانبـەری یـەکـەوە بـوون ٢. دژایـەتی؛ کـار یـان ڕەوتی سەرپێچکاری کـردن ‹اگـر کـار بـە تقابـل بکشد نتیجه‌اش قابل پیش‌بینی نیست: ئـەگـەر کـار بگاتـە دژایەتی ئاکامەکەی پێش‌بینی ناکرێت›.

**تقارب** / taqārob/: [عربـی]/اسـم. [ادبـی] ١. نێزیکـی؛ نزیکـی؛ هـەنـازی ٢. ڤـێک‌کـەتی؛ وێک‌کەوتی؛ هەڤگری.

**تقارن** / taqāron/: [عربـی]/اسـم. [ادبـی] ١. [ریاضـی] دەقـاودەقـی بیچمگـەل و ڕیـزی پاژگـەل لـە دوو لای خاڵـێک، خـەتێک یـان ڕووپـەڕێـک ٢. پێـوەنـدی نێـوان پـاژەگـەلی دوو شـتی وەک یـەک ٣. [مجـازی] هاوکـاتی؛ هاوچاخی؛ هاوچـەرخـی نێوان دوو یـا چـەنـد ڕووداو ‹تقارن مـاه رمضان بـا عیـد نـوروز: هاوکـاتی مانگی ڕەمەزان لەگەڵ جەژنی نەورۆزدا›.

**تقاص** / taqās/: [عربـی]/اسـم. [گفتـاری] ١. سـزا؛ تـاوان؛ وەباڵـبەرە؛ سـزای کـاری خـراپ ٢. تۆڵـە؛ کـار و ڕەوتی قـەرەبووی کـاری ناڕەوا لە کەسێ‌کردنەوە.

▣ **تقـاص پـس دادن:** سـزا دیتنـەوە؛ تـاوان دانـەوە ‹گفتم آخرش یک روز تقـاص آن کـار را پس مـی‌دهـی: وتم ئـاخری ڕۆژێـک سـزای ئـەم کارەت دەبینیەوە›.

**تقـاص گـرفتن:** تۆڵـە سـەندنـەوە؛ حـەق سـاندنەوە؛ قەرەبووکردنـەوە ‹مـی‌خواسـت تقـاص خـون بـرادرش را بگیـرد: دەیویـست تۆڵەی **خوێنی** براکەی بسێنێتەوە›.

**تقاضا** / taqāzā، ـهـا/: [عربـی]/اسم. ١. داخـواز؛ بخـواز؛ تکـا؛ خوایـشت ‹تقاضـا مـی‌کـنم بـه کـار ایشان رسیدگی کنید: تکـا دەکـەم بـە کـاری ئـەوان ڕابگـەن› ٢. خـوازە؛ داخـواز؛ داوا ‹تقاضـای اسـتخدام: خـوازەی دامـەزران› ٣. [اقتـصاد] داخـوازی؛ داواکـاری؛ داوخـوازی کارنیـاری؛ خـوازە؛ داخـوازی شـتومـەک یـان ڕاژەگـەلێـک. بـەرانبـەر: **عرضـه** ‹تقاضـا بـرای خرید نفت کاهش یافت: خـوازە بـۆ کـڕینی نـەوت کەم بووەوە›.

**تقاضـانامه** / taqāzānāme، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. داخوازنامـە؛ خـوازەنامـە؛ خواسـتنامە؛ داواکـاری‌نامـە؛ نووسـراوەیـەک زیـاتر بـۆ خـاوەن پلـە یـان بـەرپرسێ کـە نووسەر تێیدا شتێکی داوا کردووە.

**تقاطع** / taqāto'/: [عربـی]/اسـم. ١. [نامتـداول] یـەکبـڕی؛ تـەقیـان؛ کـار یـان ڕەوتی یـەکتـر بـڕین؛ یـەکبـڕین ٢. /ـهـا/ بـڕگا؛ دابـڕین؛ بڕگـە؛ جێگایـەک کـە دوو یـا چـەن شـت یـەکتـری دابـڕن؛ جێگـای لێـک دابـڕان ‹سر تقاطع با عـابری تـصادف کـرد: لـە سـەر بڕگاکـە دای لە ڕێبوارێک›.

**تقاعد** / taqāo'd/: [عربـی]/اسـم. وەنیـشتەیـی؛ دانیـشتەیـی؛ خانـەنـشینی؛ کـەنـارگری؛ دۆخ یان چۆنیەتی درێـژە نـەدانی کـار و پیـشە، بـە پێی داب و دەستوور، بە گرتنی مووچەوە.

**تقبـل** / taqabbol/: [عربـی]/اسـم. وەرگـری؛ ڤـەخـۆگری؛ هـەڵـگری؛ کـار یـان ڕەوتی وەئەستۆگرتن.

▣ **تقبـل کـردن:** وەئـەسـتۆگرتن؛ بـوارا کـردن؛ ڤـەخـۆگرتن؛ هـەڤـگرتن؛ قـەبووڵ کـردن ‹نگهداری او را تقبل کـرد: بـەخێـو کـردنی ئـەوی وەئەستۆگرت›.

**تقبـیح** / taqbîh/: [عربـی]/اسـم. خراپـەبێـژی؛ کار یا ڕەوتی بـە خـراپ زانـین یـا خراپـە وتـن

‹روزنامەها کار او را تقبیح می‌کردند: ڕۆژنامەکان خراپەی کارەکەی ئەویان دەکوت›.

**تق ــ تق** / taqtaq/: صوت. تەقەتەق؛ تەق‌وتۆق؛ تیق‌ـتیق؛ تەق‌وپۆق؛ دەنگێکی وەک دەنگی تەقاندنی گوللە لە دوورەوە یان پێکدادانی چەن شت.

**تق ــ تق** / teqteq/: اسم. خرەخڕ؛ دەنگی هێواشی وێکخواردنی چەن شت.

**تقدس** / taqaddos/: [عربی]/اسم. [ادبی] پیرۆزی؛ پاکی؛ دۆخ یا چۆنیەتی پیرۆز بوون ‹خیلی اظهار تقدس می‌کرد و جانماز آب می‌کشید: زۆر لە خۆیەوە پیرۆزی دەنواند و مەرایی دەکرد›.

**تقدم** / taqaddom/: [عربی]/اسم. پێشکەوت؛ وەرکەوت؛ دۆخ یان چۆنیەتی جێگرتن لە پێش شتان یان کەسانی‌ترەوە. بەرانبەر: **تأخّر**

▣ **تقدم داشتن**: لە پێشەوە بوون؛ لە بەرەوە بوون؛ لە پێشقە چوون؛ وەڵێوە بیەی ‹در آن اداره بر دیگران تقدم داشت: لەو مەزرینگەیەدا لە پێشەوەی ئەوانی‌ترەوە بوو›.

**تقدیر** / taqdîr، ـها/: [عربی]/اسم. ١. /ـات/ چارەنووس؛ چارەبەش؛ ناوچاو؛ قەلەم نویس؛ تاسین‌ردێن ٢. سپاس؛ کار یان ڕەوتی پێزانین؛ قەدر زانین ٣. [قدیمی] خەملکاری؛ کار یان ڕەوتی سەنگاندن؛ خەمڵ‌کردن؛ نەهاندن؛ نرخاندن؛ هەسبان.

▣ تقدیر بودن: چارە بوون؛ چارەنووس بەو شێوە بوون ‹تقدیر این بود که باز هم همدیگر را ببینیم: چارەنووس وابوو کە دیسان یەک ببینینەوە›.

تقدیر شدن: ڕێز (لێ) گیران ‹از تلاش و کوشش کارکنان تقدیر شد: لە هەوڵ و تێکۆشانی کارمەندان ڕێز گیرا›. هەروەها:

**تقدیر کردن**

تقدیرنامە / taqdîrnāme، ـها/: [عربی/فارسی]/اسم. ڕێزنامە؛ نامەیەک کە بە مەبەستی سپاس و پێزانین لە کار یا کردەوەی کەسێک دەنووسرێت.

تقدیس / taqdîs/: [عربی]/اسم. کار یا ڕەوتی بە پیرۆز زانین یا لە ڕیزی پیرۆزان دانان ‹من این عشق را واقعاً تقدیس می‌کنم: من ئەم ئەوینە بە ڕاستی پیرۆز دەزانم›.

تقدیم / taqdîm/: [عربی]/اسم. پێشکەش؛ ئاراستە؛ کار یا ڕەوتی دانی شتێک بە کەسێکی گەورەتر یان بەڕێزتر ‹چقدر تقدیم کنم؟: چەند پێشکەش بکەم؟›.

▣ تقدیم شدن: پێشکەش‌کران؛ ئاراستە کران؛ درانی شتێک بە کەسێکی بەڕێز ‹این گلها از طرف فرزندان به مادر تقدیم شد: ئەم گوڵانە لە لایەن منداڵەکانەوە بە دایکیان پێشکەش کرا›.

تقدیم کردن: پێشکەش‌کردن؛ ئاراستە کردن ‹دسته گلی به میهمانان تقدیم کرد: چەپکە گوڵێکی پێشکەش بە میوانان کرد›.

هەروەها: **تقدیم نمودن؛ تقدیم فرمودن**

تقدیمی / taqdîmî/: [عربی]/اسم. پێشکەشی ‹بستەی تقدیمی حاوی یک جلد کتاب است: بەستەی پێشکەشی کتێبێکی تێدایە›.

تقرب / taqarrob/: [عربی]/اسم. [ادبی] نزیکی؛ نزیکایەتی؛ خزمایەتی؛ کار یا ڕەوتی نزیک بوونەوە؛ نزیکەوە بیەی ‹این پادشاه به ارادت درویشان در بهشت است و آن پارسا به تقرب پادشاهان در دوزخ: ئەم پادشایە لە بەر دۆستایەتی دەروێشان بەهەشتی بەرکەوتووە و ئەو پارسایە بە هۆی نزیکی پاشایانەوە لە پاتشایان لە دۆزەخ ڕۆنیشتووە›.

▣ تقرب جستن: (خۆ) نزیک‌کردنەوە؛ خۆ نزیکەوە‌کردن؛ وێ نزیکەوە وسەی ‹با

تلاش زیاد به دستگاه وزیر تقرب جست: به تەقالای زۆرەوە خۆی لە دام و دەزگای وەزیر نزیک کردووە›.

**تقریب** / taqrîb، ـها/: [عربی]/اسم. ١. *[نامتداول]* نێزیکی؛ نزیکی ٢. نزیک؛ هەندێک کە بە ڕاستیەوە نزیکە ‹ خطای محاسبه با تقریب پنج در هزار است: هەڵە لە بژاردندا نزیک بە پێنج لە هەزارە›.

**تقریبا** / taqrîban/: [عربی] قید. نزیکەی؛ لە دەوروبەری؛ بزان ـ مەزان؛ نزیک بە شت، دۆخ یان چۆنیەتی مەبەست ‹تقریبا هزار تومان بود: نزیکەی هەزار تمەن بوو›.

**تقریبی** / taqrîbî/: [عربی] صفت. نزیکەیی؛ نەتەواو، بەڵام زۆر نزیک بە ڕاستی.

**تقریر** / taqrîr، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ١. ڤەگۆیی؛ کار یان ڕەوتی وتنەوە؛ گوتنەوە؛ گەڕاندنەوە؛ واتەیوە ‹آنچه را دیده بود برایم تقریر کرد: ئەوەی دیبووی بۆی گوتمەوە› ٢. *[نامتداول]* کار یان ڕەوتی دانپێدانان؛ پێهاتن؛ پەنەئامای.

**تقریظ** / taqrîz، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. نووسراوەیەک بۆ سپاس و ستایشت لە بەرهەمێکی وێژەیی یان هونەری، بە تایبەت کتێب.

**تقسیط** / taqsît/: [عربی]/اسم. پاژبەندی؛ بەشبەشی ‹تقسیط بدهی‌های دولت: پاژبەندی قەرزەکانی دەوڵەت›.

**تقسیم** / taqsîm، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. دابەش؛ بەش: ١. کار یان ڕەوتی بەش کردن ‹پول به چهار بخش مساوی تقسیم شد: پارەکە بە چوار بەشی وەک یەک دابەش کرا› ٢. *[ریاضی]* یەکێک لە چوار کارە سەرەکیەکان، بۆ زانینی ئەوەی کە چەندێتیەک چەند جار لە یەکێکی تردا هەیە ‹شانزده را به چهار تقسیم می‌کنیم می‌شود چهار: شازدە بە چوار دابەش دەکەین دەبێتە چوار› ٣. کار یان ڕەوتی جیاوەکردنی چەندیەتیەک بە ڕێژەی دیاریکراو ‹تقسیم سود شرکت: دابەشی قازانجی بەشدارگە› ٤. بڵاو؛ کار یان ڕەوتی بەشینەوە ‹پولش را میان بچه‌هایش تقسیم کرد: پارەکانی لە ناو منداڵەکانیدا دابەش کرد› ٥. *[زیست‌شناسی]* کار و ڕەوتی دابەشین؛ زاوزێ لە ڕێگەی دوو یان چەند کەرت بوونەوەوە ‹تقسیم سلولی: دابەشینی خانەیی›.

◙ **تقسیم به نسبت:** بەش بە ڕێژە؛ بەش بەشێن؛ کار یان ڕەوتی بەش ـ بەش کردن بە گوێرەگەلی دیاریکراو.

**تقسیم کار:** کاربەشی؛ دابەش کردنی کار.

**تقسیم‌بر** / taqsîmbar/: [عربی/ فارسی]/اسم. بەش بە؛ دابەش بە؛ ناوی نیشانەیەک بە بیچمی«÷» کە نیشان دەدا هەندی لای چەپ بە هەندی لای ڕاستدا دابەش دەبێت.

**تقسیم‌بندی** / taqsîmbandî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. بەش‌بەندی؛ پاژبەندی؛ دابەشکاری؛ کار یا ڕەوتی دابەش‌کردنی شتێک بە بڕگە، بەش یان تیکەگەلێک ‹تقسیم‌بندی زمینهای شهری: پاژبەندی زەوینگەلی شاری›.

**تقصیر** / taqsîr، ـها/: [عربی]/اسم. ١. کەمتەرخەمی؛ هەڵە؛ گونە؛ کۆتایی؛ دریغی؛ کار یا ڕەوتی جوان ئەنجام نەدانی کارێک یان ئەنجامدانی کارێکی خراپ ‹راننده تقصیر کرده است و باید مجازات شود: ڕانندەکە کەمتەرخەمی کردووە و دەبێ سزا بدرێ› ٢. /ـات/ سووچ؛ تاوان؛ گوناح؛ گونا؛ پیازە؛ خەتا ‹تقصیر من چیست؟: سووچی من چیە؟› ٣. کاری کوڵ‌کردنەوە یان تاشینی قژ و گرتنی نینۆک لە کاتی حەج‌کردندا.

**تلمبه‌خانه** / tolombexāne، ـها/: [ترکی/ فارسی]/اسم. ترۆمپاخانه؛ ژوورێک که بۆ گواستنه‌وه‌ی تراو، ترۆمپایه‌کی گه‌وره‌ی تێدا دانراوه.

**تلمذ** / talammoz/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* شاگردی؛ به‌رده‌ستی وه‌ستا و مامۆستا بۆ فێر بوون.

▣ تلمذ کردن: ۱. شاگردی کردن؛ لای مامۆستایه‌ک ده‌رس خوێندن ۲. خوێندن؛ وانه خوێندن؛ وانه‌ی.

**تلمیح** / talmîh، ـات/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* هه‌ڵبه‌ست یان په‌ندێکی به‌ناوبانگ و جێبڕوا که ده نووسراوه یان وتاردا ئاماژه‌ی پێده‌که‌ن.

**تلمیذ** / telmîz، تلامذه؛ تلامیذ/: [عربی]/اسم. *[نامتداول]* خوێندکار؛ قوتابی؛ شاگرد.

**تلنبار** / talambār, talanbār/: صفت. قه‌لاچن؛ قه‌لانچین؛ قه‌لاپه‌چن؛ قه‌لاقووچ؛ قه‌لاقوچکه؛ تلۆقه؛ ستێڕ؛ شخلی؛ ته‌په‌کراو؛ که‌ڵه‌که‌کراو؛ کۆما؛ کۆکراو ‹همه‌ی کتابهایش را روی تخت تلنبار کرده: هه‌موو کتێبه‌کانی له سەر ته‌خته‌که‌وه قه‌لاچن کردووه›: **تلمبار**

**تلنگر** / talangor، ـها/: اسم. په‌له‌پیتکه؛ پڵتۆک؛ پڵتۆکه؛ پلتۆک؛ پیتکه؛ ترنگ؛ ترنگه؛ پتیکه؛ تپکه؛ پته؛ پت؛ پله؛ پلیک؛ پڵتک؛ به قامک له شتێک دان ‹خیلی نازک است، یک تلنگر بزنی می‌شکند: زۆر ناسکه، په‌له‌پیتکه‌یه‌کی لێبده‌ی ده‌شکێ›.

**تلواسه** / talvāse، ـها/: اسم. دڵه‌ڕاوکێ؛ دڵه‌ته‌پێ؛ ترس؛ نیگه‌رانی؛ ئه‌ندێشه؛ دڵبه‌دوایی؛ دڵه‌ودوایی؛ دڵخورتی؛ دڵ په‌رێشانی.

**تلوتلو** / telowtelow, telo:telo:/: اسم. *[گفتاری]* لاره‌_لار؛ داره‌_دار؛ تلاوتل؛ لۆره‌_لۆر؛ لۆژه‌_لۆژ؛ ته‌ته‌ڵه‌_ته‌ته‌ڵ؛ لاروا_لاروا؛ ڕه‌ته‌ڵ؛ له‌تره‌_له‌تر؛ خنگل_خنگل؛ شه‌وس_شه‌وس؛ جووڵه‌ی خۆبه‌خۆیی (نه‌ویستی) به‌ره‌و چه‌پ و ڕاست له به‌ر خۆنه‌گری.

▣ تلوتلو خوردن: له‌تردان/ بردن؛ تلاوتل چوون؛ ڕه‌تبردن؛ ڕه‌ته‌ڵدان؛ خنگلین؛ له‌تر پێکه‌ی ‹پیرزن تلوتلو می‌خورد، ترسیدم بیفتد: پیره‌ژنه‌که له‌تره‌له‌تری ده‌کرد، ترسام نه‌ک بکه‌وێ›.

**تلوریم** / telor(î)yom/: [انگلیسی]/اسم. تیلوریۆم؛ توخمی کیمیاوی وه‌ک کانزا، به ژماره‌ی ئه‌تومی ٥٢ و کێشی ئه‌تومی ١٢٧,٦٠: **سیلوانیم**

**تلوگو** / telûgo/:/اسم. تیلووگۆ: ۱. له نه‌ته‌وه‌گه‌لی دراویدی دانیشتووی هێند ۲. زمانی تیلووگۆ ۳. ـها/ هه‌رکام له خه‌ڵکی ئه‌و نه‌ته‌وه‌یه.

**تلون** / talavvon/: [عربی]/اسم. ۱. ڕه‌نگامه‌یی؛ ڕه‌نگواڕه‌نگی؛ ڕه‌نگاوڕه‌نگی ۲. دۆخ یان چۆناوچۆنی ڕه‌نگ گۆڕان ‹از تلون برخی در عجبم: له ڕه‌نگ‌گۆڕانی بڕێک سەرم سووڕ ماوه› ۳. *[مجازی]* وازوازی؛ ڕاڕایی؛ تاوتاوی؛ ڕه‌وتی هه‌ر ساتێک له سه‌ر سازێک بوون.

▣ تلون طبع: عه‌نته‌ر مه‌زاجی؛ نه‌گرساوی خۆ و خده. هه‌روه‌ها: **تلون مزاج**

**تلویح** / talvîh/: [عربی]/اسم. هێما؛ ئیما؛ ئاماژۆک؛ کار یان ڕه‌وتی ئاماژه‌کردنی به ده‌م قسه‌یێکی تره‌وه و له تۆی باسێکی تردا.

**تلویحا** / talvîhan/: [عربی]قید. به هێماوه؛ به ئیما ‹تلویحا به من فهماند که مایل نیست بیابد: به هێماوه تێی گه‌یاندم که نایه‌وێ بێت›.

**تلویحی** / talvîhî/: [عربی] صفت. هێمایی؛ ئیمایی؛ نه‌ڕێسات؛ سه‌ربه‌ستراو؛ داپۆشراو؛ ڕووبه‌ستراو؛ به پێوار؛ به هێما و ناڕاسته‌وخۆ.

تلویزیون / televîziyon, telvîzyon، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. تەلەفزیۆن: ١. کەرەسەیەک بۆ پیشاندان و ڕاگەیاندنی دەنگ و ڕەنگ ٢. [مجازی] بەرنامەی تەلەفزیۆن ‹دو ساعت تلویزیون نگاه کردم: دوو سەعات تەلەفزیۆنم تەماشاکرد›.

تلویزیونی / televîziyonî, telvîzyonî/: [فرانسوی] صفت. تەلەفزیۆنی؛ سەر بە تەلەفزیۆن ‹برنامەهای تلویزیونی: بەرنامەگەلی تەلەفزیۆنی›.

تله / tale، ـها/: اسم. تەڵە؛ پاداو: ١. تەڵمە؛ ئارە؛ خەپک؛ داوخەفک؛ لابک؛ خەفک؛ تەلی؛ باڵان؛ فاق؛ فاقە؛ ئامرازێک بۆ گرتنی گیانلەبەر ‹تلە موش: تەڵە مشک› ٢. [کنایی] داو؛ دامی؛ هەر چەشنە ئامێرێک یان بەرنامەیەک بۆ گیرۆدارکردنی کەسێک ‹معلوم شد برایش تله گذاشتەاند: دەرکەوت کە تەڵە یان بۆ ناوەتەوە›.

▣ تلەی انفجاری: تەڵەی تەقینەوەیی؛ جۆرێ ماک کە بەهۆی دەستلێدان یان جێبەجێ‌کردنەوە، دەتەقێتەوە.

▣ تله گذاشتن: تەڵە نانەوە؛ تەڵە نیانەوە؛ داو داخستن؛ تەڵەوە نیەی: ١. دانانی تەڵە بۆ گرتنی گیانلەبەران ٢. [کنایی] داو نیانەوە؛ تووشی دەردیسەرکردن.

به تله افتادن: بە تەڵەوە بوون؛ بوونە تەڵەوە؛ کەوتنە تەڵەوە؛ بە تەڵەوە پێچیان؛ گیر و بەن بوون؛ تووش بوون.

به تله انداختن: خستنە تەڵەوە؛ بە تەڵەوە کردن؛ تووش‌کردن؛ ئەنەتەڵە وسەی.

تلەپات / telepāt/: [فرانسوی] صفت. تیلیپات؛ خاوەن هێزی تیلیپاتی.

تلەپاتی / telepātî/: [فرانسوی]/اسم. تیلیپاتی؛ پێوەندی بە هەست، بیر یان تەنانەت چاو، لە دوورەوە و نێوان دووکەس، بە بێ ئەوەی هیچ ئامرازێک نیاز بێ.

تلەسییژ / telesiyej، ـها/: [فرانسوی]/اسم. تیلێ‌سییژ؛ کەرستەیەکی گواستنەوەیی بە شێوەی نیمکەتی ئاوێزان و لکاو بە کابڵێکەوە، بۆ هاوردن و بردنی مسافر لە بلندایییەوە.

تلەفیلم / telefîlm، ـها/: [فرانسوی]/اسم. تیلێ‌فیلم؛ فیلمی تەلەفزیۆنی.

تلەکابین / telekābîn، ـها/: [فرانسوی]/اسم. تیلێ‌کابین؛ هۆدەی ئاوێزان بە کابل یان تەسمەیێکەوە بۆ هاوردن و بردنی کەسان لە شوێنگەلی کوێستانی و سەخڵەتەوە.

تلەکنفرانس / telekonf(e)rāns/: [فرانسوی] ☜ دورسخنی

تلەگذاری / talegozārî، ـها/: اسم. کار و ڕەوتی داو نانەوە؛ ئامادەکردن و نانەوەی تەڵە بۆ گرتنی گیانلەبەران.

تلەمتر / telemetr/: [فرانسوی] ١. ☜ دورسنج ٢. ☜ فاصلەسنج

تلەمتری / telemetrî/: [فرانسوی]/اسم. دووورپێوی: ١. زانست یا ڕەوتی پێوانی چەندیەتی لە ڕێگای دوورەوە ٢. /ـها/ ئەو زانیاریانەی لەو ڕێگاوە کۆ دەکرێتەوە و هەڵدەسەنگێندرێن ＊ دورسنجی

تلەموش / talemûš، ـها/: اسم. تەڵەمشک؛ تەڵەملە؛ خەفک؛ جۆرێکی تەڵەی تایبەت بۆ گرتنی مشک.

تلیت / tilît, telît/ ☜ ترید

تلیسه / talîse، ـها/: اسم. ١. نوێن؛ نوین؛ بەرکەڵ؛ گای مێینەی سێ‌ساڵان ٢. پارێن؛ پارێنە؛ گوێلپار؛ پارگوێل؛ پارگوێر؛ پانێر؛ گوێرەکەی پێگەیشتوو.

تلیله / talîle، ـها/: [؟]/اسم. شێلاقە؛ ناوی چەند جۆرە پەلەوەری چکۆلە لە تیرەی مەلانی کەناری، بە دەندووکی درێژ و لە

بڕێکیاندا چەماوە، پێی بڵند و پەڕ و باڵی پەڵ- پەڵ و ڕەنگاوڕەنگەوە.

**تم** / tem، ــها/: [فرانسوی]/اسم. ناوەڕۆک ‹فیلم تم عاشقانه داشت: فیلمەکە ناوەڕۆکی ئەویندارانەی بوو›.

**تمارض** / tamāroz، ــها/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی خۆ لە نەخۆشی دان؛ نەخۆش نواندن ‹آزاد تمارض کرد و در جلسه حاضر نشد: ئازاد خۆی لە نەخۆشیدا و لە دانیشتنەکەدا بەشداری نەکرد›.

**تماس** / tamās، ــها/: [عربی]/اسم. ١. دۆخ یان ڕەوتی پێکگەیشتنی دوو یا چەند شت، لانی‌کەم لە شوێنێکدا ‹محل تماس: شوێنی پێکگەیشتن› ٢. پەیوەندی؛ کار یا ڕەوتی پێوەندی‌گرتن (بە شێوەی وتووێژ یان نامە) ‹تماس گرفتن: پێوەندی‌گرتن›.

▣ **تماس برقرار کردن:** پەیوەندی دامەزراندن؛ پێوەندی چێ‌کرن؛ پێوەندی پێک‌هێنان ‹به زودی توانست با همشاگردیهایش تماس برقرار کند: زۆر زوو توانی دەگەڵ هاوقوتابییەکانیدا پەیوەندی دابمەزرێنێ›.

**تماس پیدا کردن:** ١. پێک‌گەیشتن؛ پێک‌گەیین؛ وێ‌کەفتن؛ پێوە تەقین؛ پنەیاوەی؛ یاوەی یۆی؛ لێکدان ٢. پێوەندی‌گرتن؛ پێوەندیدار بوون لە گەڵ کەسی‌تردا * **تماس یافتن**

**تماس داشتن:** ١. پێوەتەقین؛ گەییشتنەوە یەک ‹در نقطه‌هایی که با زمین تماس داشت ساییده شده بود: لەو شوێنانەی کە دەتەقیە زەویەوە سوابوو› ٢. پێوەندی بوون ‹مدتها با او تماس داشتم: ماوەیەکی زۆر لە گەڵی پێوەندیم بوو›: **در تماس بودن**

**تماس گرفتن:** پێوەندی‌گرتن؛ پەیوەندی گرتن لە گەڵ کەسێکدا بۆ پەیڤین.

تماس یافتن ☜ **تماس پیدا کردن**

در تماس بودن ☜ **تماس داشتن**

**تماشا** / tamāšā/: [عربی/ ؟]/اسم. سەیر؛ تەماشا؛ تماشا؛ تەواشا؛ تواشا؛ مێزە؛ فەت؛ فە؛ ئیسفا؛ فت؛ مەیزە؛ مەیز؛ ڕەوتی ڕوانین لە شتێ یان شوێنێ‌کردن بۆ سەرگەرم بوون یان خۆش ڕابواردن؛ چاو لێکردن؛ ڕوانین؛ نۆڕین؛ دیەی.

▣ **تماشا داشتن:** سەیر بوون؛ شیاو بۆ دیتن ‹کارهایی که می‌کند تماشا دارد: ئەو کارانەی دەیکات سەیریان هەیە›.

تماشا کردن: چاولێکردن؛ تواشا کردن؛ سەر خڕ دایین؛ لێ‌نوارین؛ ڕوانین؛ مەیزاندن؛ بەرادان؛ فتراندن؛ فت‌کرن؛ دیەی؛ هەونیایش؛ وەینیایش؛ تەماشە کەردەی؛ چاو لە کەسێک یان شتێ‌کردن بەتایبەت بۆ سەرگەرمی و ڕابواردن.

بە تماشا گذاشتن: ڕانان؛ پیشاندان؛ نواندن؛ نیشاندان؛ لە بەر چاو دانان؛ ڕێکخستنی شتێک بۆ چاو لێکردنی خەڵکی.

**تماشائی** / tamāšāî/: [عربی] ☜ **تماشایی**

**تماشاچی** / tamāšāčî، ــها؛ ــان/: [عربی/ ترکی]/اسم. بینەر؛ وینەر؛ نوارێن؛ نواچی؛ سەیرکەر؛ تواشاچی؛ تەماشاچی.

**تماشاخانه** / tamāšāxāne/: [عربی/ فارسی] /اسم. تەماشاخانە؛ تواشاخانە؛ جێگایەک (زۆرتر بەشێوەی ماڵێک بە دەم و دەزگای تایبەتەوە) بۆ بەڕێوە بردن و پیشاندانی شانۆ لە بەر چاو بینەران.

**تماشاگر** / tamāšāgar، ــها؛ ــان/: [عربی/ فارسی]/اسم. بینەر؛ وینەر؛ سەیرکەر؛ تماشاچی؛ تواشاچی.

**تماشاگه** / tamāšāgah/: [عربی/ فارسی]/اسم.

/ادبی/ ڕوانگـه؛ ڕوانینگـه؛ نواگـه؛ نواڕگـه؛ بینینگـه؛ تـه‌ماشـاگه؛ شـوێنی شیاو بـۆ چـاو لێکردن.

**تماشـــایی** / tamāšāyî/: [عربـی] صـفت. ١. دڵـڕفێن؛ دیـتنی؛ شـیاوی دیـتن ‹جـای تماشـایی قـشنگی اسـت: شـوێنێکی دڵـڕفێن و جوانـه› ٢. سـه‌یـر؛ سـه‌رسووڕێنه‌ر؛ سـه‌یـر و سه‌مه‌ره ‹کارهایی تماشایی می‌کند: کاری سـه‌یـر و سه‌مه‌ره ده‌کات› ✻**تماشائی**

**تمـــام**[1] / tamām/: [عربـی]اسـم. /گفتـاری/ هـه‌مـوو؛ گـش؛ گـشت؛ گـشک؛ گـرد؛ پـاک؛ ته‌ڤ؛ ته‌واو؛ تـواو؛ تـه‌مـام ‹دیشب تمام دوستان منزل ما بودند: دوێشه‌و هه‌موو هـه‌والان لـه ماڵـی ئێمه بوون›.

◘ تمام بـودن: تـه‌واو بـوون: ١. دوایـی هـاتن؛ کۆتایی هاتن؛ دمـایی ئامـه‌ی ‹این هفته کار تمام است: ئـه‌م حـه‌وتـه‌یـه کـار تـه‌واوه› ٢. دروسـت و بـێ‌کـه‌مایـه‌سـی بـوون ‹همه چیزش تمام است: هه‌موو شتێکی ته‌واوه›.

تمـام شـدن: بڕانـه‌وه؛ تـه‌واو بـوون؛ دوایـی هـاتن؛ قوتـار بـوون؛ قـه‌تـان؛ قـه‌تیـان؛ قـه‌دیـن؛ تـه‌مـان؛ هـه‌رادیـای؛ تـه‌مامیـه‌ی؛ ماردش.

تمـام کـردن: تـه‌واوکـردن: ١. دوایـی هێنـان؛ هـیچ نـه‌هێـشتنه‌وه؛ دوایـی پـێ‌هێنـان؛ تـه‌مامنـه‌ی ٢. /کنایی/ مـردن؛ گیـان دانـه ده‌سـه‌وه ‹ساعت پنج صبح تمام کرد: کاتژمێری پێنجی به‌یانی ته‌واوی کرد›.

**تمام**[2]: صفت. تـه‌واو؛ تـواو؛ تـه‌مـام؛ پیـه‌ک: ١. بێ‌که‌م و کـووڕی؛ خـشت؛ ڕێـک ‹یـک هفتـه‌ی تمام: حـه‌وتـه‌یـه‌کـی تـه‌واو› ٢. هـه‌راد؛ دوایـی هاتوو ‹پولم تمام شده بود: پاره‌کەم ته‌واو ببوو›.

**تمـام**[3]: قیـد. /گفتـاری/ یـه‌کجـاری؛ ئێجگـاری؛ تێکڕایی؛ بـه تـه‌واوه‌تی؛ پـاک لـه پـاکی؛ سـه‌ر لـه بـه‌ر؛ بـه‌گـشتی؛ یـه‌کـسه‌ره؛ یـه‌کڕاسـت؛ یه‌کهۆ؛ گژ؛ گشک؛ جـه‌مـین ‹همـه را تمـام بـرده بودند؛ سیبها تمام خراب شد: هـه‌موویـان یـه‌کجـاری بردبوون؛ سێوه‌کان یه‌کجاری خراپ بوون›.

**تمـام**ـ[4]: پیشواژه. تـه‌واوـ ؛ بـێ‌کـه‌م و کـووڕ ‹تمامنما: ته‌واونوێن›.

**تمامـا** / tamāman/: [عربـی]قیـد. پـاک لـه پاک؛ سه‌ر له بـه‌ر؛ تێکـڕا؛ گـرد؛ بـه تـه‌واوه‌تی؛ بـه تـه‌واوی؛ بـه‌یـه‌کجاری؛ ئێجگـاره‌کـی؛ بـه تێکـڕایی؛ گـشت لـه گـشت؛ گشتاوگـشت؛ بـه‌گـشتی؛ تـه‌واو ‹گوجه‌فرنگـی‌هـا تماماً خـراب بودند: ته‌ماته‌کان پاک له پاک خراپ بوون›.

**تمـــامرخ** / tamāmrox/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. تـه‌واوڕوو؛ ده‌بـه‌رگـری هـه‌مـووی ڕوخسار ‹تصویر تمامرخ: وێنه‌ی ته‌واوڕوو›.

**تمامرنـــگ** / tamāmrang/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. /عکاسـی/ پانکروماتیـک؛ تـه‌واوڕه‌نـگ؛ خـاوه‌ن هـه‌سـته‌وه‌ری بـه تـه‌واوی تیشکان (وه‌ک سوور و سه‌وز و...).

**تمامرویـــه** / tamāmrûye/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. /کانی‌شناسـی/ ڕێـک؛ ڕێـکوپێـک؛ بـه تایبه‌تمه‌ندی لـه هـه‌مـوو بارێکـه‌وه ده‌قـاوده‌ق هاتنه‌وه.

**تمـامعیـار** / tamām'ayār/: [عربـی] صـفت. ١. بـێ‌خـه‌وش؛ پوخـت و پـاراو؛ تـه‌واوعـه‌یـار؛ ڕووت؛ پـاک ‹طـلای تمـام عیـار: زێـڕی بـێ‌خـه‌وش› ٢. تـه‌واو؛ شـه‌ش‌دانـگ ‹دزد تمامعیار: دزی ته‌واو›.

**تمـــامقـد** / tamāmqad/: [عربـی] صـفت. سه‌رتاپـا؛ سـه‌راپـا؛ تـه‌واو قـه‌د ‹عکس تمامقد: وێنه‌ی سه‌رتاپا›.

**تمـامنمـا** / tamāmnemā/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. بـالانـوێن؛ ئاوێنـه؛ شـانده‌ری تـه‌واوی و بێ کـه‌م و کـووڕی شـتێک ‹شعرهای او تـصویر تمـامنمـای روزگـاش اسـت: شـیعره‌کانی وێنـه‌ی بالانوێنـی سه‌رده‌میه‌تی›.

**تمــام‌وقــت** / tamāmvaqt/: [عربـی] *صفت.* تـه‌واوکـات؛ تـه‌واو وه‌خـت؛ پێـوه‌ندیـدار بـه هـه‌مـوو سـه‌عاتـانی کـاره‌وه. بـه‌رامبـه‌ر: **پاره‌وقت**

**تمــام و کمــال** / tamām-o-kamāl/: [عربـی] *قید.* به تـه‌واوی؛ سـه‌ر لـه بـه‌ر ‹دزد همه چیز را تمام و کمال جارو کرده و برده بود: دزه‌کـه هـه‌موو شـتێکی سـه‌ر لـه بـه‌ر گـه‌سـک لـێ دابـوو و بردبوونی›.

**تمــامی** [1] / tamāmî/: [عربـی]/*اسم.* دوایـی؛ کۆتایی؛ دمایی.

▣ تمـامی نداشـتن: دوایـی (بـۆ) نـه‌بـوون؛ نه‌بڕانه‌وه؛ بێبڕانه‌وه بـوون؛ دمـایی نـه‌بیـه‌ی ‹کارهـا تمـامی ندارنـد: کـاره‌کـان دوایـیان نـیـه›.

**تمــامی** [2]: *صفت.* هــه‌مــوو؛ گــشت؛ گــش؛ هـه‌مـی؛ تـه‌واوی؛ گـژ؛ گـشک؛ گـرد؛ تـواو؛ تـه‌مـام ‹تمـامی میـوه‌هـا خـراب بودنـد: هـه‌مـوو میوه‌کان خراپ بوون›.

**تمــامی** / tamāmî/: *اسم.* هـه‌مـوو؛ هـه‌مـی؛ گشت؛ گـشک؛ گـژ؛ گـرد؛ تـه‌واو ‹کتابهـا تمـامی فـروش رفتـه بـود: کتێبـه‌کـان هـه‌مـوویان فرۆشرابوون›.

**تمامیــــت** / tamāmîyyat/: [عربــی]/*اســم.* یه‌کپارچه‌یـی؛ دۆخ یـان چۆنـاوچۆنی بـێ‌کـه‌م و کووڕی.

▣ تمامیت ارضـی: یـه‌کپارچـه‌یـی نیـشتمانی؛ یـه‌کپارچـه‌یـی وڵاتێـک و پارچـه‌ـپارچـه نه‌بوونی.

**تمامیـت‌خــواه** / tamāmîyyatxāh، ــهـا؛ ــان/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت.* [سیاسـت] پـاوانخواز؛ خاوه‌ن خوو یان ئۆگری پاوانخوازی.

**تمامیـــــت‌خـــــواهی** / tamāmîyyatxāhî/: [عربـی/ فارسـی]/*اسـم.* [سیاسـت] پـاوانخوازی؛ خـاوه‌ن بـیر و بـڕوا بـه نیـازی بـه ده‌سـته‌وه گــرتنی تـــه‌واوی هێـــز و دام و ده‌زگـــای ده‌سه‌ڵاتی.

**تمـایز** / tamāyoz، ــهـا؛ ــات/: [عربـی]/*اسـم.* جیـاوازی؛ لێـک‌جیـاوازی: ١. دوو لایـه‌ن یـان چـه‌نـد لایـه‌ن بـوون لـه بـاری چۆناوچۆنیـه‌وه ‹وجه تمایز آنها چیست؟: باری جیاوازییان چیه؟› ٢. سه‌رپشکی؛ باشتری؛ هـه‌ڤـیازی؛ بـه‌بـژاری؛ وه‌رتـه‌ری ‹مگـر چـه تمایزی بـا بقیـه دارد؟: بـۆچی جیاوازی له‌گه‌ڵ باقیدا چیه؟›.

**تمایـل** / tamāyol، ــهـا؛ ــات/: [عربـی]/*اسـم.* ١. خواســت؛ ویــست؛ مووکــه‌مــووت؛ دۆخ یــان چۆنیـــه‌تی دڵپێـــوه بـــوون ‹آن تمایـل و هواخـواهی کـه از جانـب مـردم نـسبت بـه او ابـراز می‌شد، از میان رفت: ئـه‌و ویستـه و لایـه‌نگریـه‌کـه لـه لایـه‌ن خـه‌ڵـکه‌وه سـه‌بـاره‌ت بـه ئـه‌و پیـشان ده‌درا، لــه نێــو چــوو› ٢. ئــۆگره‌تی؛ بــره‌و؛ گره‌وه‌یـی ‹تمایـل او بـه مـسائل اجتمـاعی مـشخص اسـت: ئۆگره‌تی بـه بابـه‌تگـه‌لی کۆمـه‌ڵایـه‌تیـه‌وه دیاره›.

▣ تمایــل داشـــتن: دڵ پێـــوه بـــوون؛ دڵ تواسن؛ دڵ ترچیان؛ دڵ گه‌ره‌ک بیه‌ی.

**تمبـر** / tam(b)r، ــهـا/: [فرانـسوی]/*اسـم.* تـه‌مـر؛ ته‌مـره؛ پارچـه قاقـه‌زێکـی چـاپکراوی چکۆلـه بـه نرخێکـی تایبـه‌تـه‌وه کـه لـه بـه‌رانبـه‌ر خزمـــه‌تێکـــه‌وه، ده‌وڵـــه‌ت لـــه خـــه‌ڵـــکی ده‌ستێنێ.

▣ تمبر باطله: ته‌مـری لـه‌کارتـه؛ تـه‌مـرێ کـه مۆری خواردبێت یا له باو که‌وتبێت.

تمبـر یـادبود/ یادگـاری: تـه‌مـری بیرئـانین؛ تـه‌مـرێ کـه بـه‌بۆنـه‌ی ڕووداوێکـه‌وه چـاپ کرابێ.

**تمبرباز** / tam(b)rbāz، ــهـا؛ ــان/: [فرانـسوی/ فارسـی]/*اسـم.* تـه‌مربـاز؛ ئـه‌وه‌ی حـه‌زی لـه کۆکردنـــه‌وه و هـــه‌ڵـــگرتنی تـــه‌مـــری جۆراوجۆره.

تمبردار / tam(b)rdār، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] صفت. تەمردار؛ بە تەمر ‹پاکت تمبردار: پاکەتی تەمردار›.

تمبک / tombak/ ☜ تُنبک

تمتع / tamatto'/: [عربی]/اسم. [ادبی] کەڵک گری؛ کەڵک لێوەرگری؛ بەرخورداری؛ بەهرەمەندی؛ بەهرەگری؛ چێژەگری.

▣ تمتع یافتن: بەهرەگرتن؛ بەهرەمەند بوون؛ کەڵک لێوەرگرتن؛ بەرخوردار بوون؛ چێژە وەرگرتن.

تمثال / temsāl، ـها/: [عربی]/اسم. ١. وێنە؛ بیچم یا شێوەی کەسێک (لە رووی ڕێزەوە دەگوترێ) ٢. هەیتاڵ؛ کۆتەڵ؛ پەیکەر.

تمثل / tamassol/: [عربی]/اسم. ١. کار یا رەوتی وێنە هاوردنەوە؛ وێنە هێنانەوە ‹بە حکایت سعدی تمثل جستم کە فرمود...: وێنەم بە چیرۆکێکی سەعدی هێنایەوە کە فەرمووی ...›.

تمثیل / tamsîl، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. پارچەهەڵبەست یان کورتە چیرۆکێک کە بۆ وێنە لە ناو وتار یان نووسراوەدا دەگوترێ.

تمجمج / tamacmoc/: [عربی]/اسم. [ادبی] منجەمنج: ١. مینگەمینگ؛ بۆڵە؛ پرتە و بۆڵە؛ کار یان رەوتی لە ژێر لێوەوە و بە ناڕوونی قسەکردن ٢. [مجازی] کار یان رەوتی خستنە پشت گوێ؛ خۆکەڕکردن؛ ئاوڕ نەدانەوە لە خواستی کەسێک.

تمجید / tamcîd، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] کار یان رەوتی هەڵگوتن؛ پێدا هەڵگوتن، پێدا هەڵدان، بە شاندا هاتن، ناساندن و پەسندانی چاکەگەل و ژێهاتیگەلی کەسێ یان شتێک.

تمدد / tamaddod/: [عربی]/اسم. ئاسایش؛ وچان؛ پشوو؛ پیش؛ رەوتی هێور بوونەوە.

▣ تمدد اعصاب: حەسانەوە؛ حەوانەوە؛ ڤەحەسان؛ بووژانەوە.

تمدن / tamaddon، ـها/: [عربی]/اسم. شارستانیەت؛ ژیار؛ ژیاری؛ ژیوەری؛ باژێری؛ ژیوار؛ ژیوەر: ١. شارەوەری؛ قۆناغێک لە گووڕانی کۆمەڵگای دامەزراوە کە بنکە و ڕێکخراوەگەلێکی تێدا بە مەبەستی بەڕێوەبردنی ئەو کۆمەڵگەیە پێکهاتووە ‹سپیدەدم تمدن: کازیوەی شارستانیەت› ٢. بەهرەمەندی لە دەسکەوتگەلی زانست و پیشەسازی پێشکەوتوو لە کۆمەڵگادا ‹ما در سدەهای میانە از تمدن درخشانی برخوردار بودیم: ئێمە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا خاوەنی شارستانیەتێکی گەشەدار بووین› ٣. جۆری فەرهەنگ، کارامەیی و شێوەی ژیان کە مرۆ لە کۆمەڵگادا فێری دەبێ ‹مثل اینکە از تمدن بویی نبردە است: وادیارە لە شارستانیەت بێخەبەرە› ٤. جۆری ڕێکخراوە و دامەزراوە و ژێهاتوویی و دەسکەوتی فەرهەنگی لە وڵات یان چاخێکی تایبەتدا ‹تمدن اروپا: شارستانیەتی ئەورووپا›.

تمدید / tamdîd/: [عربی]/اسم. ١. کار یان رەوتی زۆرکردنەوەی ماوەی کارێک ٢. کار یا رەوتی لە سەر کارێک چوون؛ درێژەدان؛ درێژە پێدان.

▣ تمدید شدن: پێ زیاد بوون؛ لێ زیادکردن ‹مهلت ثبت نام یک هفتەی دیگر تمدید شد: مەودای ناونووسی حەوتەیەکی تری پێ زیاد بوو›.

تمدیدکردن: ١. درێژەدان؛ درێژە پێدان ٢. دانەدەم؛ درێژکردنەوە.

تمرد / tamarrod/: [عربی]/اسم. ١. سەرپێچی؛ مل پێچی؛ ملەپێچی؛ نافەرمانی؛ گوێنەدەری ‹تمرد از مافوق جرم است:

سەرپێچی لە سەرتر تاوانە› ٢. سەربزێوی؛ سەربزۆکی؛ مکووڕی؛ سەرکێشی؛ سەرکەشی ‹او مرد تمرد نیست: ئەهلی سەربزێوی نیە›.

**تمرکز / tamarkoz**، ـها/: [عربی]/اسم. /ادبی/ کار یا ڕەوتی کۆ بوونەوە؛ خڕ بوونەوەی کۆمای ئەندامانی کۆمەڵێک لە شوێنێکدا ‹تمرکز ثروت در پایتخت: کۆ بوونەوەی دارایی لە پایتەختدا›.

**تمرگیدن / tamargîdan**/: مصدر. لازم. /گفتاری/ // **تمرگیدی**: داتەپای؛ **می‌تمرگی**: دادەتەپی؛ **بتمرگ**: داتەپە// داتەپین؛ داتەپان؛ داتەمران؛ داتەمرین؛ داسەکان؛ داکاسیان؛ کاسیایرە؛ ئەرەکاسیەی: ١. داسرەکیان؛ دانیشتن؛ نیشتەیرە؛ ئەرەنیشتەی ‹همین‌جا بتمرگ: هەر لێرە داتەپە› ٢. مت بوون؛ مانەوە لە شوێنێکدا بەبێ جوولە ‹می‌خواست توی خانەی خودش بتمرگد و این قدر ما را عذاب ندهد: با لە ماڵەکەیدا داتەپایا و ئەوەندە ئازاری ئێمەی نەدایا› (ئەم وشە بۆ سووکایەتی‌کردن بەکار دەچێ).

■ صفت مفعولی: **تمرگیده** (داتەپیو)// مصدر منفی: **نتمرگیدن** (دانەتەپین)

**تمرهندی / tamrehendî**، ـها /: [عربی/ هندی]/اسم. تەمر هیندی؛ تەمرە هیندی: ١. دارێکی ئارانی کە بەرزایی بە ٤٠ میتر دەگات ٢. بەری ئەو دارە کە خۆراکیەکی ترشە و کەڵکی دەرمانیشی هەیە.

**تمرین / tamrîn**، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. کۆششێک بە مەبەستی لێ‌پەیدا بوون یان زۆر بوونەوەی توان و چابکی و کارامەیی لە کارێکدا.

**تمساح / temsāh**، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. تیمساح؛ کروکودیل؛ جانەوەرێکی خزۆک لە ڕیزی نەهەنگ، بە پۆزە و کلکی درێژ، چوار دەست و پێ و لەشی گڕناڵ و سەر پشت داپۆشراو بە پوولەگەلی پەڕەئاسا و ددانگەلێکی زۆری بزمارینەوە.

**تمسخر / tamasxor**/: [عربی]/اسم. /ادبی/ تیز؛ گاڵتە؛ ڕشخەن؛ ڕیشخەن؛ ڕشقەن؛ تیتاڵی؛ گەمە.

**تمسخرآمیز / tamasxorāmîz**/: [عربی/ فارسی] صفت. گاڵتەجاڕانە؛ تیزاوی؛ بەگاڵتە ‹سخن تمسخرآمیز: قسەی گاڵتەجاڕانە›.

**تمسک / tamassok**/: [عربی]/اسم. /ادبی/ دەس‌بەداوێنی؛ دەسەوداوێنی؛ چنگاوشی.

⊡ تمسک جستن: پەنا بۆ بردن؛ دەس بە داوێن بوون؛ پەنا بەردەی؛ چنگاوش بوون ‹متهم به دلیلهای مضحکی تمسک می‌جست: تاوانی سەی بە بەڵگەگەلی خەنینی دەبرد›.

**تمشک / tamešk**، ـها؛ ـان/: اسم. تووڕک؛ تووڕک؛ توودڕک؛ تیڕک؛ تیڕگ؛ تیرە؛ تووترک؛ تووتڕک؛ تووتەڕگ؛ تووتەرگ؛ ڕەدووک؛ توودزیە؛ توودڕە؛ توودڕی؛ توودلقی؛ ستری؛ تفەدڕەی: ١. ناوی چەند جۆر دارچکی دڕکدار ٢. بەری ئەو بنچکە کە خواردەمەنیێکی سوور، ئاودار و ترش و شیرینە و لە گاتوو دەچێ ❊ **تمشگ**

⊡ تمشک باغی: تووڕکە باخی؛ جۆرێک تووڕکی لەق و پۆ نەرمە کە بەسەر زەویدا دەکشێ.

تمشک جنگلی: تووڕکی دارستانی؛ جۆرێک تووتڕک کە گوڵی سپی و میوەی سوورە.

تمشک سیاه: تووڕکە ڕەشە؛ جۆرێ تووڕکە کە گوڵەکانی سپی یا ئاڵە و میوەکەی ڕەشە.

تمشک کبود: تووڕکە کەوە؛ دڕی شین؛ توودڕکەشینە؛ تووڕکی میوە ڕەش یان

کەوە.

تمشگ / tamešg/ ☜ **تمشک**

تمشیت / tamšiyat، ــها/: اعربی]/اسم. /ادبی/ ڕێخەری؛ ساماندەری؛ کار یا ڕەوتی ڕێک و پێک کردن؛ ڕێخستن؛ پەسارنەی.

▣ تمشیت امور: کار ڕێکخستن؛ بەڕێ کردن؛ کار پەسارنەی.

▣ تمشیت دادن: سامان‌دان؛ ڕێک خستن؛ خستنە ڕێ؛ ڕاوسەی؛ پەسارنایوە.

تمشیت یافتن: جۆر بوون؛ ڕێک هاتن؛ بار هاتن؛ سامان پەیداکردن؛ سامان پێدران؛ پەسارایاوە.

تمکن / tamakkon/: اعربی]/اسم. /ادبی/ ١. دەسچوویی؛ دەسڕۆیی؛ دەوڵەمەندی؛ سامانداری؛ توانستی ماڵی ٢. /ــها/ /گیاه‌شناسی/ شێوەی جێگەگرتنی هێلکۆکان لە هێلکۆگەدا.

تمکین / tamkîn/: اعربی]/اسم. گوێ لە مستی؛ گوێڕایەڵی؛ گۆشداری؛ فەرمانبەری.

▣ تمکین کردن: گوێدان؛ قەوڵ کردن؛ گوێ لە مست بوون؛ گوێ ڕایەڵ بوون؛ گوێ پێدان؛ گۆش پنەی‌دەی؛ گۆش دارەی ‹به حرف کسی تمکین نمی کرد: گوێی بە قسەی کەس نەدەدا›.

تملق / tamalloq، ــها/: اعربی]/اسم. کلکەسووتە؛ مێچگە؛ مێچک؛ زمان‌لووسی؛ شالووزی؛ هولیسکی؛ حولیاتی؛ مای‌مای؛ مەرایی؛ موسموس؛ مەلاق؛ لامە؛ خولتە؛ ماستاوکەری؛ شەلاف؛ باریکەڕیسی؛ سفتە؛ ڕەفملۆ؛ قسە یان کرداری پڕمەرایی و درۆینە.

تملق آمیز / tamalloqāmîz/: اعربی/ فارسی] صفت. خولتەکەرانە؛ زمان‌لووسانە؛ موسمووسانە؛ مەراییانە و تێکەڵ بە زمان‌لووسی ‹سخنان تملق آمیز: وتەگەلی خولتەکەرانە›.

تملق گویی / tamalloqgûyî، ــها/: اعربی/ فارسی]/اسم. زمان‌لووسی؛ هولیسکی.

تملک / tamallok/: اعربی]/اسم. ١. ماڵ؛ سامان؛ دارایی ٢. خاوەنیەتی؛ خێویەتی.

▣ تملک داشتن: خاوەن بوون؛ دارا بوون.

بە تملک درآوردن: بوونە خاوەن؛ بە دەس‌هێنان؛ بە خاوەن بوون؛ بە دەس ئاردەی.

تملیک / tamlîk/: اعربی]/اسم. ١. کار و ڕەوتی کردنە خاوەن؛ خێویەتی شتێک دان بە کەسێک ٢. /ــها/ شەوژەن؛ جۆرێک قوڵف و بەستی دەرگا کە لە پشتەوە دادەخرێت.

تملیکی / tamlîkî/: اعربی] صفت. خاوەن‌دار کراو؛ بە کەسێکی‌تر ئەسپاردە.

تمنا / tamannā، ــها؛ تمنیات/: اعربی]/اسم. تکا؛ لاڵە؛ هێقی؛ خوایشت؛ خواهیشت؛ خوازەی خاکەسارانە: **تمنّی**

▣ تمنا داشتن: تکاکار بوون؛ خوازیار بوون؛ خوایشت هەبوون ‹شخصی آمده و از جنابعالی تمنایی دارد: کەسێک هاتووە و لە بەڕێزتان تکایێکی هەیە›.

تمنا کردن: تکا کردن؛ خوایشت‌کردن؛ پاڕانەوە؛ لالانەوە؛ ئەوەلالیەی ‹تمنا می کنم، ایشان را ببخشید: تکا دەکەم، بیبەخشن›.

تمنی / tamannā/: اعربی] ☜ **تمنا**

تمنیات / tamannîy(y)āt/: اعربی] جمعِ ☜ **تمنا**

تموج / tamavvoc، ــها/: اعربی]/اسم. /ادبی/ کار یان ڕەوتی شەپۆل لێدان یان قەمچ و پێچ خواردن.

تموز / tamûz/: اسریانی]/اسم. تەمووز: ١.

مانگی حەوتەمی ساڵی هەتاوی بڕێک لە ولاتە عەرەبیەکان، بەرانبەر لە گەڵ مانگی ژوویە یا جووڵای، کە ٣١ ڕۆژە ٢. مانگی چوارەمی ڕۆژمێری دینی و مانگی دەیەمی ڕۆژمێری عورفی جوولەکە.

**تمول** / tamavvol/: [عربی]/اسم. ماڵ؛ سامان؛ دارایی.

**تمهید** / tamhîd، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ڕێخۆشکەری؛ پێکئانی: ١.کار یان ڕەوتی بەرهەڤکردن و بوار خۆشکردن ٢. چارەدۆزی؛ بەردەباری ٣. کار و ڕەوتی ئابووران؛ پێکهێنان.

**تمهیل** / tamhîl/: [عربی]/اسم. کار یا ڕەوتی دەرفەت دان؛ ماوە پێدان؛ مۆڵەت دان.

**تمیز** [1] / tamîz/: [عربی]/اسم. ١. هاوێر؛ کار یا ڕەوتی ناسینەوە یان هەڵاواردنی شتان یا دیاردەگەلی لێک جیاواز ٢. *[دستور]* بەرکاری دووهەمی یەک بکرد (لە ڕستەی «همه آرام را بد می‌پنداشتند: گشتیان ئارامیان بە خراپ دەزانی» «بد» و «خراپ» بەرکاری دووهەم (تمیز)ی پێدەڵێن).

⊡ **تمیز دادن:** هەڵاواردن؛ جیا کردنەوە؛ ناسینەوە؛ ناسین و لێککردنەوەی شتانی تر ‹در این جمله می‌توان سه حالت دستوری را تمیز داد: لەم ڕستەدا دەکرێ سێ باری ڕێزمانی لێک هەڵاویرین›.

**تمیز** [2]: صفت. *[گفتاری]* تەمیس؛ پاک؛ خاوێن؛ وێژە؛ پاراو؛ بژوون؛ هیلاو؛ پوختە ‹لباس تمیز: جلوبەرگی تەمیس›.

⊡ **تمیز شدن:** خاوێن بوونەوە؛ پاک بوونەوە؛ تەمیس بوون؛ پوختە بیەیوە ‹چند بار شستم تا خوب تمیز شد: چەند جار شۆردم تا باش خاوێن بووە›.

**تمیز کردن:** خاوێن کردنەوە؛ پاک کردنەوە؛ تەمیس کردن؛ پوختەکەردەی ‹فرچەها را تمیز کن بگذار سر جایشان: فڵچەکان خاوێن کەوە و بیاننێیە سەر جێگای خۆیان›.

**تمیزی** / tamîzî/: [عربی]/اسم. تەمیسی؛ تەمیزی؛ پاکی؛ خاوێنی؛ پوختەیی ‹ظرفها از تمیزی برق می‌زد: قاپەکان لە تەمیسیدا بریقەی دەداوە›.

**تمییز** / tamyîz/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کار یان ڕەوتی ناسینەوە؛ جیاکردنەوە؛ هەڵاواردن؛ ناسینی جیاوازی شتێک لە گەڵ شتێکی تردا.

**تن** / tan، ـها/: اسم. ١. لەش؛ لاشە؛ تەن؛ کەلەسە؛ کەلەستە؛ کەلەخ؛ پەیکەر؛ گەت؛ گۆدە؛ گۆڤدە؛ لەس؛ لەخت؛ کۆمەڵەی پێکهاتەی ماکی بوونەوەری زیندوو ‹تن و جان: لەش و گیان› ٢. کەس؛ یەکەی ژماردنی مرۆڤ ‹پنج تن: پێنج تەن›.

⊡ **تن به کار دادن:** *[کنایی]* خۆ لە کار دان؛ قۆڵ (لێ) هەڵماڵین؛ تەن دانە قەزا؛ باسک لێ هەڵکردن؛ چۆڵێ هۆرکەردەی ‹اگر تن به کار بدهد، زود یاد می‌گیرد: ئەگەر خوی لە کار بدا، زوو فێر دەبێت›.

**تن خود را چرب کردن:** *[کنایی]* خۆ دانان؛ خۆ تەیارکردن بۆ تووش زەحمەتێک هاتن؛ بەرهەڤ بوون بۆ دەردی سەری.

**تن دادن/ دردادن:** مل‌دان؛ کۆڵ‌دان؛ کۆڵ پێدان؛ مل پێدان؛ مل پیاکردن ‹هر چه با او صحبت کردم تن نداد که با من بیاید: هەر چەندە قسەم لەگەڵ کرد ملی نەدا بکەویتە تەکم›. هەروەها: **تن ندادن/ درندادن**

**تن زدن:** *[ادبی]* مل‌پێچی کردن؛ وەرنەگرتن؛ خۆ نەدان؛ وێ نەدەی.

**تن کردن:** *[گفتاری]* کردنە بەر؛ پۆشین؛ پۆشان؛ لە بەرکردن؛ لخۆکردن؛

کەردەینە؛ لە بەر کردنی شتێک ‹لباست را [illegible]: جلەکانت [illegible]›: **بر/ بە تن کردن**

تن کسی خاریدن: *[کنایی]* سەر کەسێ خوران/ خوریان؛ سەری کەسێک ئێشان؛ شەقێ وریەی؛ لە شوێن دەردیسەر و کێشەدا بوون ‹مگر [illegible] کە داری سر بسرم می‌گذاری؟: [illegible] سەر ئەنیتە سەرم؟›.

تن کسی را لرزاندن: گشت گیانی کەسێک هێنانە لەرزەوە؛ تەکان و شەکان بە کەسێک دان؛ کەسێک تووڕە، ناڕاحەت یان پەرێشان‌کردن یا ترساندن.

هەروەها: **تن کسی لرزیدن**

بر/ به تن کردن ☜ **تن کردن**

به تن داشتن: لە بەرا بوون؛ لەبەردا بوون؛ پۆرەرە بیەی؛ جل و بەرگ لە بەرا بوون ‹پالتو خاکستری [illegible]: پاڵتاوێکی خۆڵەمێشی [illegible]›.

تن / ton/: [فرانسوی]/اسم. تون: ١. یەکەی کێشانە بەرامبەر بە ١٠٠٠ کیلۆگرەم ٢. /ها/ /موسیقی/ تۆن؛ چۆنیەتی دەنگ لە باری زیلی و بەمی یا بەرزی و نزمیەوە: **تون** ٣. تیرەیەک ماسی پوولەکەداری خۆراکی کە زۆرتر کۆنسێرڤی لێ چێ دەکەن: **ماهی تُن**

▣ تن بلند: تونی قورس؛ یەکەی کێشانەی ئینگلیزی و ئەمریکی بەرامبەر بە ١٠١٦ کیلۆگرەم.

تن کوتاه: تونی سووک؛ یەکەی کێشانەی ئینگلیزی و ئەمریکی بەرامبەر بە ٩٠٧ کیلۆگرەم.

تن آسا / tanāsā، ها؛ یان/: صفت. *[کنایی، ادبی]* تەنپەروەر؛ لەش‌گران؛ دەست و پێ سپی؛ تەوەزەل؛ تەمەڵ.

تن آسائی / tanāsāʾî/ ☜ **تن‌آسایی**

تن آسایی / tanāsāyî، ها/: اسم. *[کنایی، ادبی]* تەنپەروەری؛ لەش‌گرانی؛ ڕەوتی خۆ لە کار نەدان: **تن‌آسائی**

تناب / tanāb، ها/: [عربی]/اسم. ١. تەناو؛ تەناف؛ تەنافە؛ شریت؛ شریتە؛ کەبەند؛ ڕێسراوێکی زۆرتر ئەستوور لە ماکێکی نەرم ٢. گوریس؛ گورێس؛ وەرێسە؛ گورویس؛ پەتی ئەستوور ❋ **طناب**

▣ تناب پشتی: *[زیست شناسی]* مۆغەرە؛ مۆرتخە؛ مازە؛ بربرە؛ گازەڕا؛ گازەرە؛ لوولەیێک لە پشت ملەوە تا خوار کەمەر لە لەشی برێ گیانلەبەران کە بنەمای سەرەکی لەشیانە: **مازە**

تناب صوتی: ژێی گەروو.

تناب نخاعی: مۆخی پشت.

▣ تناب مفت پیدا کردن: *[کنایی]* ڕۆنی مفتە گیر هێنان؛ بە هۆی لە بەر دەستدا بوونی شتێکی بەلاش، کەوتنە ئازەوە و خۆ تووش‌کردن ‹باز تناب مفت پیدا کرده، می‌خواهد خودش را دار بزند: دیسان ڕۆنی مفتەی گیر هاتووە، قوونگی خۆی پێ دەناوێ›.

با تناب پوسیدەی کسی به چاه رفتن: *[کنایی]* کەوتنە شوێن قسەی کەسێکەوە؛ فریوی کەسێکی نابار و نارێک خواردن و دڵ پێی خۆش‌کردن.

روی تناب ارزن پهن کردن: *[کنایی]* مەویز لە سەر ڕەشکە هەڵخستن؛ کردنە منجەمنج؛ بۆ نەدانی شتێک بڕ و بیانووی نەگونجاو هێنانەوە.

تناب‌بازی / tanāb.bāzî، ها/: [عربی/ فارسی]/اسم. تەناف‌بازی؛ جۆرە وەرزش و گەمەیەک کە بە گرتنی دوو سەری گوریسێک و هەڵسووڕاندنی، بە سەریدا باز

دەدەن: **طناب‌بازی**

**تناب‌پیچ** / tanābpîč/: [عربی/ فارسی] *صفت*. گوریس‌پێچ؛ تەناف‌پێچ؛ بەسراو یان بەسەبەنی‌کراو بە تەناف ‹صاحبخانه را تناب‌پیچ کرده بودند: خاوەن ماڵەکەیان گوریس‌پیچ کردبوو›: **طناب‌پیچ**

**تنابنده** / tanābande/: *اسم. [گفتاری]* مشەکەر؛ جووقەوار؛ تاقەکەس؛ کەس؛ یۆ؛ بەنەخوا؛ بنیادەم ‹هیچ تنابنده‌ای پیدا نشد، بپرسم: بابا، این قبرستان اسمش چیست: مشەکەرێکم نەدیتەوە لێی بپرسم: ئەرێ برا، ئەم کاول بووە ناوی چیە›.

**تنازع** / tanāzo'/: [عربی] *اسم*. ١. بەرەنگاری؛ ململانێ؛ کێش‌مەکێش؛ کار یان رەوتی تێک‌هەڵپڕژان یا بە شەڕ هاتن لەگەڵ یەکتریدا ٢. پەل‌وپۆ بۆ ژیان.

◙ **تنازع بقا**: پەل‌وپۆی ژیان؛ شەڕی مان؛ شەڕی ژیان: ١. کێشە و شەڕ بۆ مانەوە ٢. *[زیست‌شناسی]* کردوکۆشی گیانلەبەران بۆ زاڵ بوون بە سەر دوژمن و بارودۆخی وادا کە بیانخاتە مەترسی لەناو چوونەوە.

**تناس** / tanās/: *اسم. [گفتاری]* فەت؛ فەتق؛ تەناز؛ تەناس؛ هەڵتۆقیوی بەشێک لە بەرگەدە، بە بۆنەی ناسک بوونەوە یان پچڕانی ماسوولکەی ئەو جێگایە لە لەشدا.

**تناسب** / tanāsob، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم*. ١. هاوڕێژەیی؛ هاوڕیزەیی؛ هاوڕێژی؛ هاوگری؛ هەڤگری ‹تناسب سنی: هاوڕێژەیی تەمەنی› ٢. هاوگری؛ وێکەوی؛ یەکگری؛ هەڤگری؛ هەماهەنگی؛ رەوتی یەک‌گرتنەوە ‹این رنگها با هم تناسب ندارند: ئەم رەنگانە لەگەڵ یەکدا هاوگریان نیە/ یەک ناگرنەوە› ٣. *[ریاضی]* هاوڕێژەیی؛ دۆخی رێکبوونی دوو رێژە ٤. *[ادبیات]* ☜ مَراعات نظیر، **مُراعات**

◙ **تناسب اندام**: بەژن‌رێکی؛ هاوگری ئەندامانی لەش پێکەوە.

**تناسب عددی**: هاوڕێژەیی ژمارەیی؛ هاوگری ژمارەیی؛ بەرامبەر بوونی دوو رێژەی ژمارەیی (وەک: ٢-٦ = ٤-٨).

**تناسب مرکب**: هاوڕێژەیی لێکدراو؛ هاوڕێژەیی تێکەڵ؛ هاوڕێژەییەک کە زۆرتر لە دوو رێژەی تێدایە.

**تناسب مستقیم**: هاوڕێژەیی راستەوخۆ.

**تناسب معکوس**: هاوڕێژەیی بەراوەژوو.

**تناسب هندسی**: هاوڕێژەیی هەندەسی (وەک: ٢÷٨=٥÷٢٠).

◙ **تناسب بستن**: هاوڕێژە بەستن؛ دروست‌کردنی پێوەندییەک بە شێوەی:

$$\frac{a}{b} \quad \frac{\wedge}{x} \quad \rightarrow \quad x = \frac{\wedge \times b}{a}$$

**تناسب داشتن**: کاڵانەوە؛ شیاو بوون؛ وێک‌کەوتن؛ بەیەک خواردن.

**تناسخ** / tanāsox/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ١. کار یا رەوتی سڕانەوە؛ لەناو چوون و نەمان بەتایبەت بە هۆی تێپەڕ بوونی کاتەوە ٢. *[فلسفه]* دۆنادۆن؛ بڕوا بەوەی کە گیان بە مەرجی جیا بوونەوەی لە لەشی مرۆ، رادەگوێزرێتەوە بۆ لەشی مرۆیێک یان بوونەوەرێکی‌تر.

◙ **تناسخ ازمنه**: رابردنی سەردەمان؛ تێپەڕ بوون و بگاری رۆژگاران؛ ویەردەی شەو و رۆی.

**تناسخ در ارث**: مردنی میراتگران یەک لە شوێن یەک، بێ‌ئەوەی ماڵ و میراتەکە لە نێویاندا دابەش بکرێت.

**تناسخ روح**: دۆنادۆن؛ هەڵبگاردنی گیانی کەسێک پاش مەرگ لە قەوارەی بوونەوەرێکی‌تردا.

**تناسل** / tanāsol/: [عربی] *اسم. [ادبی]* زاوزێ؛ زگ‌وزا؛ سکوزا؛ کار یا رەوتی بە دنیا

هێنان.

**تناسلی** / tanāsolî/: [عربی] صفت. زاوزێیی؛ سەر بە زاوزێوە ‹اندام تناسلی: ئەندامی زاوزێیی›.

**تناظر** / tanāzor، ـها/: [عربی]/سم. هاوتایی؛ لێکچوویی؛ وەکیەکی؛ هاویەکی.

▣ تناظر یک به یک: هاویەکیەکی وا کە هەر ئەندامێک لە کۆمەڵێک، وەکوو خۆیەکی هەبێ لە کۆمەڵەیەکیتردا.

**تنافر** / tanāfor/: [عربی]/سم. [ادبی] نەیاری؛ دژهەڤی؛ دژیەکی؛ ناتەبایی؛ ناسازگاری.

**تناقض** / tanāqoz، ـها؛ ـات/: [عربی]/سم. ناتەبایی: ۱. وێک نەچوون و یەک نەگرتنی بەیەکجاری دوو دیاردە، بەجۆرێ کە هەردووکیان لە یەک جێدا پێکەوە کۆ نەبنەوە (وەک: بوون و نەبوون؛ ڕەشایی و سپیایی؛ شەو و ڕۆژ) ۲. ئەوەی لەگەڵ یەکێتردا ڕێک نەکەوێ ‹حرفهایش تناقض داشت: قسەکانی ناتەبایان بوو›.

▣ تناقض داشتن: ناتەبا بوون.

**تناقض‌گویی** / tanāqozgûyî، ـها/: [عربی/ فارسی]/سم. دژبێژی؛ کار و ڕەوتی وتنی قسەگەلێک کە یەک نەگرنەوە.

**تناوب** / tanāvob، ـها/: [عربی]/سم. نۆرەیی؛ گەڕاوگەڕی؛ چەلاوچەلی؛ دۆخ یا چۆنایەتی بە نۆرە بوونی: *الف)* مەودای کاتی یان شوێنی دیاریکراوی نێوان سەر هەڵدانەوەی دووبارەی شتێ یا دیاردەیەک *ب)* بە شوێن یەکدا هاتنی چەند شت یان دیاردە بە مەودای دیاریکراوەوە.

**تناوبی** / tanāvobî/: [عربی] صفت. نۆبەیی؛ نۆرەیی.

**تناور** / tanāvar/: صفت. [ادبی] بلەرمان؛ بلەرمە؛ بە پەیکەرێکی گەورە و ئەستوورەوە.

**تناوری** / tanāvarî/: اسم. بلەرمانی؛ دۆخ یا چۆنیەتی گەورە و ئەستوور بوون.

**تناول** / tanāvol/: [عربی]/سم. [ادبی] کار یان ڕەوتی خواردن؛ خوارن؛ واردەی؛ نۆشی گیان‌کردن.

**تناهی** / tanāhî/: [عربی]/سم. بنەتایی؛ دوایی؛ دمایی؛ دوماهی؛ بڕانەوەیی؛ دۆخ یا چۆنیەتی بە بڕانەوە بوون.

**تنباکو** / tambākû, tanbākû، ـها/: [انگلیسی از اسپانیایی]/سم. تەماکۆ: ۱. تەنبەکی؛ گەڵای تەماکۆ ۲. *[قدیمی]* توتن.

**تنبان** / tombān, tonbān، ـها/: اسم. ۱. شاپک؛ تۆمۆ؛ تەومان؛ ڕانکی؛ ڕانک؛ پاتۆڵ؛ پانتۆڵ؛ شواڵێ پان کە ناوقەدەکەی بە دۆخین یان کێش دەبەسترێ ۲. *[تعریض، گفتاری]* شواڵ؛ دەرپێ؛ پاوەرێ (بۆ گاڵتە یا سووکایەتی کردن دەگوترێ).

▣ **تنبان خود را خراب کردن**: *[کنایی]* خۆ چەپەڵ کردن؛ دەرپێی خۆ پیس کردن؛ پانتۆڵی خۆ تەڕکردن؛ گووکردن بە خۆدا؛ تۆقان؛ زراو چوون؛ زۆر ترسان.

تنبان کسی را کندن: *[کنایی]* شواڵ لە پای کەسێک دەرهێنان؛ پابەرۆ و یۆی وەتەی؛ زۆر ئازار دان و سووکایەتی بە سەر کەسێکدا هێنان.

**تنبک** / tombak, tonbak، ـها/: اسم. دمبەگ؛ دمەک؛ دومەک؛ دنبەگ؛ دمڵەک؛ تومەک؛ تومەلەک؛ دومەلەک؛ دمەلەک؛ دومهە؛ دوممە؛ سازێکی ئێرانیە بە بیچمی تۆنگی داریـن (سواڵەتی یان کانزایی) کە بنەکەی پەڕەپێستێکی ناسکی بە سەردا کێشراوە و کاتێک دەیکوتن ملەکەی لە بن هەنگڵ دەنێن و بە سەرپەنجە لەو پەڕە دەدەن: **تمبک؛ دمبک؛ دنبک**

**تنبل**[1] / tambal, tanbal، ـها/: اسم. تەمەڵ؛

تیرەیەک لە گوهاندارانی چکۆلەی شاخەی بێددانان، بە کولکی درێژ و دەست و پێی چڕنووکدارەوە کە لەسەر داران دەژین و بەو چڕنووکانە خۆ بە دارانەوە هەڵدەواسن.

**تنبل** [۲]: *صفت.* تەمەڵ؛ تەمبەڵ؛ تەپ؛ کەهاڵ؛ سەقەڵوو؛ هەمین: ۱. لەشگران؛ سەرگران؛ بارگران؛ لەشقورس؛ شەختۆ؛ مێشگرە؛ سلپ؛ تەپلۆس؛ تەپلمۆس؛ ترەک؛ دێزەک؛ بێکارە؛ تەڕاڵ؛ پالۆ؛ بێهونەر؛ ماتوڕا؛ کارنەکەر؛ فل؛ قوونگران؛ بێزار و وەڕەز لە کار و بار ‹شاگرد تنبل: شاگردی تەمەڵ› ۲. تەوەزەل؛ گۆنگرۆ؛ قەلب؛ قنگی؛ کاپەڵ؛ کاهێل؛ کاسول؛ تەنپەروەر؛ شلەپەتە؛ پفیو؛ پنتی؛ پەلشتی؛ جلنبۆر؛ کالووم؛ گەندەڵ؛ تەووش؛ تەنەلەش؛ بەربەرۆشک؛ سەرپیرێزان؛ سست؛ دێراخێز؛ دێرخێز؛ مەلەت؛ زەمر؛ تەپی؛ تەپە؛ مەدلمە؛ شل و شەوێق؛ پێگران؛ لۆژ؛ لەشە؛ مەرش؛ مەرشۆ؛ ژەڵمۆ؛ بە کردار و جموجوولی خاو و سست ‹امروز خیلی تنبل شده‌ای: ئەمرۆ زۆر تەمەڵ بوویی›.

**تنبل‌خانه** / tambalxāne, tanbal- / ـها/: *اسم.* تەمەڵخانە: ۱. ناوی جێگایەک کە کەسانی تەمبەڵ و لەشگرانی تێدا کۆ دەبنەوە، بخۆن و بخەون و هیچ نەکەن ۲. *[کنایی]* شوێنێک کە کارگێڕان و ئەندامانی وەک پێویستە کار ناکەن.

**تنبلی** / tambalî, tanbalî / ـها/: *اسم.* سستی؛ تەمەلی؛ تەنبەلی؛ تەپی؛ تەوەزەلی؛ کەلبایەیی؛ کەهالی؛ خامسەردی؛ لۆژی؛ قوونگرانی؛ خاوی؛ خۆپانی؛ خاوخاوی؛ قۆنەقۆنی؛ لەشگرانی.

▣ تنبلی کردن: شنەشن کردن؛ خنەخن کردن؛ تەمەڵی کردن؛ خۆ لە کار بواردن.

**تنبور** / tambûr, tanbûr / ـها/: *اسم.* تەمبوور؛ تەمووره؛ تەموور؛ سازێکی چوار سیمی کاسەگەورەی وەک هەمرۆیە، دەستەیێکی درێژی هەیە و بە قامکان دەیژەنن: **طنبور**

**تنبوشه** / tambûše, tanbûše / ـها/: *اسم.* سۆلینە؛ ئاوەڕۆ؛ گونجە؛ گۆنجە؛ گۆنگە؛ گۆنگ؛ گۆنج؛ مەنهۆڵ؛ نۆین؛ لوولەیەکی لە سوالەت بۆ چوونی ئاو یان دەردانی ڕەهەند.

**تنبه** / tanabboh /: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* وشیاری؛ هۆشیاری؛ شیاری؛ بێداری؛ ئاگایی ‹امیدوارم این حادثه برایش موجب تنبه باشد: هیوادارم ئەم ڕووداوە بۆی ببێتە هۆی تنبه›.

**تنبی** / tanabî / ـها/: *اسم.* *[قدیمی]* پەنجدەری؛ هۆڵ؛ دیوی گەورە: **طنبی**

**تنبیه** / tambîh, tanbîh / ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* تەمێ؛ جۆرێک سزادان بە مەبەستی ئاگادارکردنەوە لە ئاکاری نادروست؛ ئەدەب کردن.

▣ تنبیه استحقاقی: کاری ژێرکردن؛ سزایەک کە کەسێک بە بۆنەی لادانی لە کارێک تووش دەبێ.

تنبیه بدنی: لێدان؛ کوتەککاری؛ تەپلەکۆ.

▣ تنبیه شدن: ۱. تەمێ بوون؛ تەمێ کران؛ تاشان؛ تەپلەکۆ بیەی ۲. عارنان؛ ژێر بوون؛ لە سۆنگەی سزا دیتنەوە؛ وشیار بوونەوە. هەروەها: **تنبیه کردن**

**تنبیهی** / tambîhî, tanbîhî /: [عربی] *صفت.* بۆ تەمێ کردن؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی تەمێوە.

**تن‌پرور** / tanparavar / ـها؛ ـان/: *صفت.* *[کنایی]* ۱. تەمەڵ؛ تەوەزەل؛ بێلەش؛ لەشقورس؛ لەشگران؛ تەپلۆس ۲. تەنپەروەر؛ خۆ خۆشەویست؛ لەش بە

دۆشاو؛ دەستوپێ سپی.

تن‌پروری / tanparvarî، ـها/:/اسم. [کنایی] ۱. تەمەڵی؛ تەوەزەلی؛ لەش‌قورسی؛ لەش‌گرانی ۲. تەن‌پەروەری؛ خۆ خۆشەویستی.

تن‌پوش / tanpûš، ـها/:/اسم. تەن‌پۆش؛ وەرپووش؛ پۆشەن؛ جل و بەرگ؛ پووشەن؛ جنک؛ هەنجگ؛ گنج؛ پرتاڵ؛ لیباس؛ ئەوەی لەشی پێ دادەپۆشن.

تنتور / tantûr، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] تەنتوور؛ تێکەڵی دەرمانێک لەگەڵ ئەلکولدا: **طنطور**

▣ تنتور ید: تراوی یود و ئەلکول کە بۆ خاوێن‌کردنەوەی برین بە کار دێ.

تنجیم / tancîm/:[عربی]/اسم. ئەستێرەژمێری؛ ئەستێرەوانی؛ هەسارەگەری.

تنخواه / tanxāh، ـها/:/اسم. پارەی نەخت؛ نەختینە (لە زێڕ و زیو و پارە و...).

تنخواه‌گردان / tanxāhgardān/:/اسم. پارەگەردان؛ پارەیەک کە بۆ خەرجگەلی وەگەڕ و ڕێورایی دەدرێتە کەسێک یان لێپرسراوێک پاشان سەری مانگ یان سەری ساڵ لەگەڵی حیساب دەکرێتەوە.

تند / tond/: صفت. توند؛ تون؛ تن؛ تونگ: ۱. گورج؛ گورد؛ کرژ؛ تروسک؛ تیژ؛ تیژ؛ بە خێرایی زۆرەوە. بەرانبەر: **کند** ۲. [مجازی] قەڵس؛ تووڕە؛ جاڕز؛ گرگین؛ ئاژرین؛ تەنگەتیکە؛ تەنگەتاو؛ کەسکین؛ ئاڵەتی ‹زود تند می‌شد و هرچه به ذهنش می‌آمد می‌گفت: زوو توند دەبوو و هەرچی بە دەمیدا دەهات دەیگوت› ۳. تیژ؛ تیژ؛ کەسکون؛ کەسکوول؛ بە گۆژمەیی و کارتێکەری ئازاردەرەوە ‹بوی تند؛ حرف تند؛ مزەی تند: بۆنی تیژ؛ قسەی توند؛ ڕەنگی توند؛ چێژەی تون›.

▣ تند بودن: توند بوون؛ تون بوون؛ تن بیەی: ۱. [مجازی] تووڕە بوون؛ قەڵس بوون؛ جاڕز بوون ‹او آدم تندی است: مرۆڤێکی توندە› ۲. [مجازی] غەزرین؛ ڕەقینی بوون؛ تووڕە بوون ‹این مقاله خیلی تند است: ئەم وتارە زۆر تونە› ۳. کەسکون بوون؛ تامی دەمسووتێن؛ توون بوون ‹غذا تند است: چێشتەکە توونە› ٤. بە تەوژم بوون؛ پرتاو بوون؛ خێرا بوون؛ گورج بوون ‹آب تند است: ئاوەکە تونە› ٥. [مجازی] تۆخ بوون؛ پڕڕەنگ بوون ‹این آبی تند است: ئەم ئاویە توخە›.

تند شدن: ۱. [مجازی] قەڵس بوون؛ تووڕە بوون؛ هەڵچوون؛ چوونە بان سک خۆ؛ هۆرئامەی ۲. توندەوە بوون؛ تیژەوە بوون؛ خێرا بوونەوە ۳. توون بوون؛ چێژەی زۆر هەبوون ٤. هەڵگەڕان؛ تام گۆڕان؛ تامی شتێ گۆڕان لە بەر مانەوە.

تند کردن: ۱. توندکردنەوە؛ تونەوکردن؛ پاهەڵگرتن ‹وقتی پاسبان را دید تند کرد: کاتێ پاسەوانەکەی دی توندی کردەوە› ۲. خێراکردنەوە؛ تونکردنەوە؛ خێرایی پێدان ‹دستگاه را تند کرد: کەرستەکەی خێرا کردەوە› ۳. توونکردن؛ تن‌کەردەی؛ ئاڵەت پێدان ‹خورشت را خیلی تند کرده‌ای نمی‌شود خورد: خۆرشتەکەت زۆر توندکردووە، ناخورێت›.

تند[۲]: قید. [گفتاری] توند؛ تن؛ تون؛ خێرا؛ بە پرتاو؛ بەتوندی ‹تند می‌رفت: توند دەچوو›.

▣ تند رفتن: ۱. توند چوون؛ تون ڕۆیین؛ خێرا چوون؛ تن لوەی؛ تیژ شیەی؛ بەتوندی چوون ‹آزاد خیلی تند می‌رفت و من نمی‌توانستم پا به پایش بروم: ئازاد زۆر توند دەچوو، من نەمدەتوانی بە پای ئەو بڕۆم› ۲.

پـای زیادی داکێشان؛ لە ڕادە لادان؛ تەلاس‌کەردەی ‹نباید این‌قدر تند می‌رفتی: نەدەبوو ئەوندە پای زیادی داکێشی›.

**تنداب** / tondāb، ـها/: *اسم*. ١. خوڕگە؛ بەشێک لە ڕووبار کە ئاوی تێدا بە خێرایی دەڕوا ٢. ڕێژاو؛ خوڕ؛ تاف؛ ئاوی خوڕ و بەتەوژم.

**تندان** / tondān، ـها/: *اسم*. تاش؛ زنار؛ تیشەشاخ؛ ماە؛ مای؛ مایە؛ زەرد؛ لاشەی بەرز و لێژی گاشەبەرد لە چیادا.

**تندباد** / tondbād، ـها/: *اسم*. باگرۆ؛ باهۆز؛ واهوور؛ گژەبا؛ باگژە؛ واگوژە؛ باسەر؛ گوژین؛ بای بە خێرایی ٦٤ تا ٧٤ کیلۆمیتر لە سەعاتدا.

▣ **تندباد** شدید: ڕەشەبا؛ هۆڵەجنانێ؛ بای بە خێرایی ٧٥ تا ٨٧ کیلۆمتر لە سەعاتدا.

**تندپز** / tondpaz، ـها/: *اسم*. ماکرۆڤەیڤ؛ کەرەسەیەک کە بە کارەبا کار دەکا و بە پێلان گەرما بەرهەم دێنێ و زۆر خێرا ئاو دێنێتە کوڵ و خۆراک پێدەگەیێنێ.

**تندتاز** / tondtāz/: *صفت*. خۆشبەز؛ ڕەهوار؛ خۆشڕەو؛ یەکران؛ بەپا؛ ئەسپی چالاک.

**تندخو** / tondxû، ـها؛ ـیان/: *صفت*. */مجازی، ادبی/* تووڕە؛ قەڵس؛ ڕووش؛ تونەمەزاج؛ جاڕز؛ تووڕێ (بۆ مێینە)؛ خاوەن خووی شەڕانی و نەگونجاو ‹مردی تندخو و بددهن بود: پیاوێکی تووڕە و دەمشڕ بوو›.

**تندخوانی** / tondxānî/: *اسم*. توندخوێنی؛ کار، ڕەوت یان شێوازی بە خێرایی خوێندنەوەی دەقی نووسراوەیەک.

**تندخویی** / tondxûyî، ـها/: *اسم*. */مجازی، ادبی/* تووڕەیی؛ قەڵسی؛ تونەمەزاجی؛ سەرگورزی؛ تۆسنی؛ هۆکار یان ئۆگرەتی بە زیز و زویریەوە ‹تندخویی او همه را عاصی کرده بود: تووڕەیی ئەو هەمووی گیانەسەر کردبوو›.

**تندذهن** / tondzehn/: [فارسی/ عربی] *صفت*. */مجازی/* بیرتیژ؛ زیرەک.

**تندر** / tondar، ـها/: *اسم*. */ادبی/* هەورەگرمە؛ گۆلە؛ گورم؛ گوڕژ؛ زورم؛ دەنگێ کە بە هۆی هەورەتریشقەوە چێ دەبێ.

**تندراه** / tondrāh، ـها/: *اسم*. تونەڕێ؛ شاڕێ؛ شاڕا؛ ئوتووبان؛ ڕێگایەکی پان و بەرفرە بۆ هاتوچووی بە خێرایی کەرەسەگەلی ڕاگواستنەوە.

**تندرست** / tandorost، ـها؛ ـان/: *صفت*. ساق؛ لەش‌ساغ؛ تەندروست؛ تەندرس؛ خۆش؛ خوەش؛ وەش؛ سلامەت.

**تندرستی** / tandorostî، ـها؛ ـان/: *اسم*. تەندروستی؛ لەش‌ساغی؛ فەت؛ ساقی؛ سەلامەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی نەخۆشی و گەزن و تەوەرە.

**تندرو** / tondrow، ـها/: *صفت*. ١. خێرا؛ خۆشڕەو؛ خۆشبەز؛ بەزا ‹ماشین تندرو؛ اسب تندرو: ماشینی خێرا؛ ئەسپی خۆشبەز› ٢. ـان/ */سیاست/* ڕادیکاڵ؛ توندڕەو؛ تونڕەو؛ هۆگری توند و تیژی کردن لە داخوازی ڕامیاریدا ‹حزب تندرو؛ روزنامەی تندرو: حیزبی ڕادیکاڵ؛ ڕۆژنامەی توندڕەو›.

**تندروی** / tondravî، ـها/: *اسم*. تەلاس؛ زێدەڕۆیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی توندڕەو بوون.

**تندزبان** / tondzabān، ـها؛ ـان/: *صفت*. */مجازی/* زمان‌تیژ؛ زمان‌تاڵ؛ دەم‌تاڵ؛ خاوەن قسە و گفتولفتی بە تووڕەیی و ئازاردەرەوە.

**تندگیر** / tondgîr/: *صفت*. ١. خۆش‌گیر؛ خوەش‌گر؛ بە تایبەتمەندی ئاگربەری زۆرەوە ٢. زووگرس؛ خوەش‌گرس؛ بە

تایبه‌تمه‌ندی زوو سفت و پته‌و بوونه‌وه‌وه.

تندمزاج / tondmezāc, -mazāc ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی]/اسم. [مجازی] تونه‌مه‌زاج؛ ئاله‌تی؛ تووره و تون؛ ڕووشه؛ تووڕه؛ تۆسن؛ تنه‌ته‌بیات.

تندمزه / tondmaze ـها/: صفت. توند؛ توون؛ تن؛ گه‌زه‌ک؛ حه‌ڕا؛ دۆخ؛ زمان‌گه‌ز؛ تویژ؛ که‌سکوون؛ ڕووس؛ چێژه توند.

تندنویس / tondnevîs ـها؛ ـان/: اسم. شه‌ما؛ توندنووس؛ زوونووس؛ به‌له‌زنووس؛ خێرانووس.

تندنویسی / tondnevîsî/: اسم. توندنووسی؛ به‌له‌زنووسی؛ خێرانووسی؛ شه‌مایی؛ گورج و گۆڵ نووسی.

تند و تیز / tond-o-tîz ـها/: صفت. توند و تیژ؛ تن و تیژ: ۱. گرچوبڕ؛ به تام و چێژێکی یه‌کجار به هێز، به‌تایبه‌ت تاڵ یان تورشه‌وه ‹خیلی تند و تیز بود و تا بیخ گلویم را سوزاند: زۆر تند و تیژ بوو، تا بن گه‌رووی سووتاندم› ۲. [مجازی] ئازارده‌ر؛ گه‌هرێنه‌ر ‹مقاله‌اش خیلی تند و تیز بود: وتاره‌که‌ی زۆر تند و تیژ بوو›.

تند و تیز: قید. [گفتاری] گورج و گۆڵ؛ کرژ و کۆڵ؛ توند و تۆڵ؛ به‌توندی؛ چالاکانه؛ ئازایانه؛ به‌له‌ز؛ خێرا ‹تند و تیز برو دنبالش: تند و تیژ برۆ به دوایدا›.

تنده / tonde ـها/: اسم. لێژگه؛ نشێو؛ سه‌ره‌وخواری تون؛ لێژایی تیژ؛ قه‌دپاڵی چڕوڕک.

تندی / tondî/: اسم. تونی: ۱. تووونی؛ تنی؛ بار یان دۆخی توند بوون ۲. گورجی؛ توندی؛ خێرایی ۳. ـها/ [مجازی] توندی؛ تووڕه‌یی؛ تێژی؛ قه‌ڵسی ‹خیلی با او تندی کردم: زۆرم تووڕه‌یی له‌گه‌ڵدا کرد› ٤. تامی تیژی؛ چێژه‌یه‌ک که ده‌بێته هۆی سووتانه‌وه‌ی زمان (وه‌کوو تامی بیبار).

تندیس / tandîs ـها/: اسم. [ادبی] په‌یکه‌ر؛ هه‌یکه‌ل؛ تووز؛ سوێس؛ کۆته‌ڵی گیانله‌به‌ر.

تنزل / tanazzol ـها/: [عربی]/اسم. ۱. نوشووس؛ نوشوست؛ شکانی ‹کیفیت کارتان تنزل کرده است: کاره‌که‌تان نوشوستی کردووه› ۲. کار یان ڕه‌وتی دابه‌زین؛ داشکان؛ کز بوون؛ که‌م‌کردن؛ هاتنه خواره‌وه؛ هندکان ‹تنزل بهای نفت: دابه‌زینی نرخی نه‌وت›.

⊡ تنزل کردن: ۱. نوشوست هێنان؛ که‌م کردن؛ دابه‌زین؛ ئه‌ره‌ووه‌سه‌ی ۲. که‌م بوونه‌وه؛ هندکان؛ هه‌لسان.

تنزل یافتن: هاتنه خوار؛ دابه‌زان؛ که‌م بوون؛ هندکان؛ هه‌لسان؛ ئه‌ره‌ووه‌سه‌ی.

تنزیب / tanzîb ـها/:[عربی]/اسم. ته‌نزیف؛ نه‌وارێکی پارچه‌یی په‌مۆینه‌ی تۆڕئاسای سپی که له زام به‌ستنه‌وه‌دا به کار ده‌ڕوا.

تنزیل / tanzîl ـها /:[عربی]/اسم. سوو؛ نسوو؛ به‌هره‌ی پاره؛ هێزی پووڵ.

⊡ تنزیل دادن: پاره به سوو دان؛ پاره به باره‌وه به وام دان.

تنزیل کردن: نه‌خت‌کردنه‌وه‌ی به‌ڵگه‌یێکی ماوه‌دار به که‌م‌کردنه‌وه‌ی سوو.

تنش / taneš ـها/: اسم. ۱. بار؛ گوشاری ڕۆحی، زه‌ینی یان عاتیفی ۲. گێره‌وکێشه؛ ئالۆزی؛ لێلی یان دوژمنایه‌تی له په‌یوه‌ندی نێوان دوو گرۆ یان ده‌وڵه‌تدا.

تنش‌زا / tanešzā/: صفت. کێشه‌ساز؛ به تایبه‌تمه‌ندی یان توانایی پێکهێنانی کێشه‌وه ‹سخنان تنش‌زا: وته‌گه‌لی کێشه‌ساز›.

تنش‌زدایی / tanešzdāyî ـها/: اسم. کێشه‌لابه‌ری؛ کار یان ڕه‌وتی له نێو بردنی کێشه؛ هێورکردنه‌وه.

**تنصیف** / tansîf/:[عربی]/اسم. *[ادبی]* کار یان ڕەوتی لەت‌کردن؛ دوو کوت‌کردن؛ نیوە/ نیمەکردن؛ کوت‌کەردەی.

**تنظیف** / tanzîf/:[عربی]/اسم. *[ادبی]* کار یان ڕەوتی خاوێن‌کردن؛ پاکەوکردن؛ پاک کردنەوە؛ تەمیس‌کردن؛ پوختەکەردەی.

**تنظیم** / tanzîm، ـها؛ ـات/:[عربی]/اسم. هەڵوەژێری؛ کار یان ڕەوتی ڕێک‌وپێک کردن؛ هەڵپەرتاوتن؛ مرێس‌کردن و دوزەنە پێدان.

◘ **تنظیم بودجه**: کار و ڕەوتی بووجەکرن؛ نڤیسینی بووجە.

**تنظیم خانواده**: بەرنامەیەکی لە پێش ڕەچاوکراو بۆ دیاری‌کردنی ژمارەی منداڵ و لێ‌نەترازان لەو ڕیچەیە.

◘ **تنظیم کردن**: ۱. هەڵوەژارتن؛ هەڵوەژاردن؛ ڕێک‌وپێک‌کردن؛ پۆڕاندن؛ مرێس‌کردن ۲. تەیارکردن؛ تەکووز کردن؛ بەرهەڤ‌کردن؛ بەڕێ خستن؛ ڕاوسەی؛ شایاندن ۳. میزان‌کردن ‹تنظیم کردن موتور ماشین: میزان کردنی موتوری ماشێن›.

**تنظیمی** / tanzîmî/:[عربی] صفت. ڕێکخراو؛ ڕێک‌وپێک‌کراو؛ هەڵوەژێراو؛ مرێس‌کراو؛ پۆڕدراو ‹سند تنظیمی: بەڵگەی ڕێکخراو›.

**تنعم** / tana'om، ـات/:[عربی]/اسم. *[ادبی]* ۱. دارایی؛ سامان؛ ماڵ‌وپارە ۲. خۆش‌ڕابوێری؛ خۆش‌بوێری؛ خوەش‌گوزەرانی؛ ئاسایش؛ وەش‌بەری.

**تنفر** / tanaffor، ـها/:[عربی]/اسم. بێزاری؛ ڕق؛ ڕک؛ قین؛ وێڕسی؛ بێزیاگی ‹تنفر زیادی در ما ایجاد شد: بێزاریەکی زۆرمان لێ پەیدا بوو›.

**تنفرنامه** / tanaffornāme، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. قین‌نامە؛ نووسراوەیێک کە بێزاری لە کار یان شتێکی تێدا ڕادەگەیێنن.

**تنفس** / tanaffos/:[عربی]/اسم. ۱. کاری هەناسە هەڵکێشان و هەناسە دانەوە ۲. /ـها/ وچان؛ پشوو؛ گت؛ پشووی کەم خایەن لە کاردا بۆ حەسانەوە ‹در فاصلەی سخنرانیها تنفس اعلام شد: لە نێوان قسەکاندا پشوو درا›.

◘ **تنفس دادن**: ۱. نەفەس پێدان؛ هەناسە گەیاندن بە لەشی کەسێک ‹مجبور شدند به او تنفس بدهند: ناچار بوون نەفەسی پێبدەن› ۲. وچان پێدان؛ پشوودان ‹در این هنگام تنفس داده شد: لەم کاتەدا وچانێکیان دا›.

**تنفس کردن**: هەناسە دان؛ نەفەس کێشان؛ هەناسە دەی ‹این هوایی که تنفس می‌کنیم بسیار آلوده است: ئەو هەوایە هەناسەی پێدا دەدەین زۆر پیسە›.

**تنفسی** / tanaffosî/:[عربی] صفت. هەناسەیی؛ نەفەسی ‹بیماری تنفسی: نەخۆشی هەناسەیی›.

**تنفیذ** / tanfîz، ـها/:[عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی برەو دان بە بەڵگەیێک بە پەسند و ئیمزا کردنی؛ بڕ پێدان.

◘ **تنفیذ کردن**: ۱. بڕ پێدان ۲. بایەخ دان؛ پەسندکردن ۳. ئیمزاکردن؛ واژۆکردن.

**تنقل** / tanaqqol، ـها؛ ـات/:[عربی]/اسم. چەرەوچەرەز؛ چەرەس؛ نوقڵ و نەوات؛ شۆرکە؛ ئاجیل.

**تنقیح** / tanqîh، ـات/:[عربی]/اسم. *[ادبی]* بژار؛ هەڵوەژار؛ کار یان ڕەوتی تەکووزکردنی نووسراوە لە باری پێ‌زیادکردن، لابردن و وردەکاریەکانیەوە.

**تنقید** / tanqîd، ـها؛ ـات/:[عربی]/اسم. *[قدیمی]* ۱. ڕەخنە؛ هەڵسەنگێنی ۲. خراپەبێژی.

تنقیه / tanqiye، ـها/:[عربی]/اسم. ۱. تەنقیە؛ کار یان ڕەوتی عیمالەکردن؛ پاک کردنەوەی ڕیخۆڵە گەورە بە تێوەڕێژانی تراوی داروویی ۲. /مجازی/ عیمالە؛ کەرەسەیەک کە ئاوا کارێکی پێ دەکرێ ۳. جۆماڵی؛ پاکماڵی هەر چەشنە گونجەیەک ‹تنقیه‌ی قنات: جۆماڵی کاریز›.

تنک / tonok/: صفت. ۱. تەنک؛ تەنی؛ نارین؛ ناسک؛ شاش؛ ناسکی سووک ‹موی تنک: مووی تەنک› ۲. /مجازی/ کەم؛ کێم؛ هندک ‹تنک‌مایه: کەم‌مایه›.

تنک‌روزی / tonokrûzî، ـها/: صفت. /مجازی، ادبی/ کەمدەسەڵات؛ بێ‌ئەنوا؛ بێبەش لە بژیوێکی ئەوتۆ.

تنک‌مایه / tonokmāye/: صفت. /مجازی، ادبی/ کەممایە؛ دەسکورت؛ دەستەنگ؛ دەسخاڵی؛ کەمڕزق؛ خاوەن سەرمایەی هندک.

تنکه / toneke, tonoke، ـها/: اسم. ۱. شورت؛ توونکە ۲. /معماری/ تەیمان؛ تەیمانە؛ تامان؛ چەپەر؛ چیخ؛ دیوارێکی ناسک لە چێو یان گەچ بۆ لێکدابڕانی دوو بەشی شوێنێک.

تنکیر / tankîr/:[عربی]/اسم. /دستور/ ڕەوتی نەناس‌کردنی ناو.

تنگ / tang/: اسم. ۱. تەنگە؛ تەنگژە؛ زندۆڕ؛ زەندۆڕ؛ زەندۆڵ؛ گەلی تەنگ؛ دەرەتەنگ؛ بوهلی‌باهو؛ دۆڵی تەنگ؛ شیوی تەنگەبەر ۲. /ـها/ تەنگ؛ تنگ؛ نەوار یان تەسمەیەکی پان کە زین، کۆپان یان باری پێ‌دەبەستنە سەر بارەبەرەوە.

تنگ: صفت. ۱. تەنگ؛ تەسک؛ بەرتەسک؛ وەرتەسک؛ تەسک‌وترووسک؛ تەسکەبەر؛ تەنگەتریز؛ تەنگەبەر؛ تەنگ‌وتورش؛ گەڕگول؛ بە بۆشایی، پانایی یان بەری کەمەوە ‹اتاق تنگ؛ کوچه‌ی تنگ: ژووری تەنگ؛ کۆڵانی تەسک› ۲. /مجازی، ادبی/ کەم؛ هندک ‹مجال تنگ: مەودای کەم›.

◘ تنگ بودن: تەنگ بوون؛ تەسک بوون؛ تەنگەبەرە بیەی.

تنگ شدن: ۱. تەنگ بوونەوە؛ تەنگەو بوون؛ بووچکەو بوون؛ چوونە ئاو؛ تەسکەوە بیەی (بە هۆی چوونە ئاوەوە) ‹پیراهنم را شستم حالا تنگ شده: کراسەکەم شۆرد، ئێستا تەنگ بووەتەوە› ۲. تەنگ بوونەوە؛ کورت بوونەوە؛ تەسک بوونەوە؛ کەم بوونەوەی بۆشایی ‹خانه برایشان تنگ شده بود: ماڵەکە تەنگ ببووەوە بۆیان› ۳. کەم بوونەوە؛ کەمەو بوونەوە؛ هندکین.

تنگ کردن: تەنگ‌کردن؛ تەنگەوکردن؛ بووچکەوکردن؛ تەسکەوەکەردەی.

بە تنگ آمدن: /مجازی/ وەڕەز بوون؛ وە زاڵەهاتن؛ وێڕس بیەی. هەروەها: **بە تنگ آوردن**

تنگ: قید. پاڵ‌بەپاڵ؛ لە پەنا؛ لە پاڵ؛ تەنگەتریزە؛ بێ‌ناوبڕ و لکاو بە یەکەوە ‹تنگ هم نشسته بودند: پاڵ‌بەپاڵی یەک دانیشتبوون›.

◘ تنگ غروب: ئەنگۆرە؛ هەنگۆرە؛ ئەنگۆری؛ هەنگڤار؛ تەنگی ئێوارە؛ نزیک خۆراوا؛ زەردەی خۆراوا؛ یەرەووتەنگ؛ وێرەگا؛ وەرەگا؛ تاریکان؛ تاریکەی؛ ڕۆژپەڕ؛ درەنگان؛ ئێوارەی درەنگ.

تنگ هم: نزیک یەک؛ لە پەنا یەک؛ لە پاڵ یان لە ئامێزی یەکتریدا.

◘ تنگ دل کسی نشستن: /مجازی، گفتاری/ بن دەس لە کەسێک برینەوە؛ لە تەنیشت کەسێکەوە دانیشتن؛ لە بن‌دەس کەسێک دانیشتن؛ لاو یۆیرە نیشتەیرە.

**تنگ کسی افتادن**: *[مجازی، گفتاری]* لە پاڵ کەسێکەوە بوون؛ لە تەنیشت کەسێکدا بوون؛ کەوتنە پاڵ/ تەنیشت یەکێکەوە.

**تنگ کسی گرفتن**: *[کنایی، گفتاری]* تەنگەتاو بوونی کەسێک؛ تەنگ لە کەسێک هەڵچنیان؛ زۆر بۆ کەسێک هاتن؛ کەوتنە پێداویستی زۆرەوە بۆ چوونە سەر ئاو.

**تنگ‌ـ**[2]: *پیشواژە.* ـتەنگ: ۱. کەمـ ؛ تەنگـ ؛ کورت؛ بە هەندێکی زۆرکەم لە شتێک (تنگ حوصله؛ تنگ‌دست: کەم‌تاقەت؛ دەس‌تەنگ) ۲. کەم و کوور؛ بەرتەسک؛ سنووردار (تنگ چشم؛ تنگدل: بەرچاوتەنگ؛ دڵتەنگ).

**تنگ** / tong، ـها/: *اسم.* ۱. گۆزەڵە؛ گۆزە؛ گۆزیێ؛ گۆزەڵێ؛ تۆنگ؛ کووزی؛ بەقۆ؛ تۆنگە؛ گومگومە؛ ئاڤگینە؛ گمگمۆک؛ دۆلکە؛ ئاڤکینە؛ دەفری مل‌باریک بۆ تراو ۲. تراوی ناو تۆنگ (تنگ را سر کشید: تونگەکەی نایە سەریەوە).

**تنگاب**[1] / tangāb/: *اسم.* تاسکەواو؛ تەنگاب؛ خۆراکێکی ئێرانی وەک ڕاگۆ.

**تنگاب**[2]: *صفت.* کەم‌ئاو؛ خەست؛ خەس؛ هەس؛ هەس و هۆڵ (بۆ چێشت).

**تنگاتنگ** / tangātang/: *صفت.* نزیک؛ پاڵ‌بەپاڵ؛ پشت‌بەپشت؛ فرە نزیکی یەکتر.

**تنگ‌چشم** / tangčešm، ـها؛ ـان/: *صفت. [کنایی، ادبی]* ۱. ڕژد؛ چکووس؛ پیسکە؛ ئاجگی ۲. بەخێڵ؛ ئێرەیی‌بەر؛ بە ئێرەیی؛ چاوچنۆک؛ گاڤبەر ۳. بەرچاوتەنگ؛ وەرچەم‌تەنگ ***چشم‌تنگ**

**تنگ‌چشمی** / tangčešmî، ـها/: *اسم. [کنایی، ادبی]* ۱. ڕژدی؛ چکووسی؛ ئاجگی ۲. ئێرەیی‌بەری؛ چاوچنۆکی؛ گاڤبەری ۳. بەرچاوتەنگی * **چشم‌تنگی**

**تنگ‌حوصله** / tanghowsele, -ho:sele، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت. [مجازی، ادبی]* بێ‌تەشە؛ کەم‌تاقەت؛ بێ‌سەبر؛ کەم‌جیقەڵدان؛ تەنگەجیقەڵدان؛ بێ‌گەپرووگ؛ بێ‌نتم؛ کەم‌تابشت.

**تنگ‌دست** / tangdast، ـها؛ ـان/: *صفت. [مجازی، ادبی]* تەنگدەس؛ دەستەنگ؛ هەژار؛ نەدار؛ بێ‌پارە؛ بێ‌ماڵ؛ کەم‌دەس؛ دەسکورت؛ فەقیر؛ دەست‌بەتاڵ؛ دەس‌والا؛ دەستڤالە؛ خاوەن بارەچەی هندک و کەمتر لە ڕادەی پێویست بۆ بە سەر بردنی ژیان.

**تنگ‌دستی** / tangdastî، ـها/: *اسم. [مجازی]* هەژاری؛ دەستەنگی؛ دەسکورتی؛ بێ‌مانگووری؛ ناگوزووری؛ فەقیری.

**تنگدل** / tangdel، ـان/: *صفت. [مجازی، ادبی]* پەرۆش؛ دڵتەنگ؛ خەمبار؛ خەمین؛ ئاخدار.

**تنگرس** / tangars، ـها؛ ـان/: *اسم.* تەنگس؛ تەنگز؛ تەنگەس؛ تەنگەزی؛ تینگیز؛ تەنگیز؛ تەنگسەک؛ چالووک؛ چالۆک؛ بنەداری تایبەتی ناوچەگەلی وشکی کوێستانی، بە لەق و پۆی درکاوی و گوڵی وەک هۆشەی سوورکاڵ و بنی زۆر پتەوەوە.

**تنگسالی** / tangsālî، ـها/: *اسم. [مجازی]* وشکەسالی؛ سیاسالی؛ ساڵێ کە تێیدا قات‌وقڕی و نەبوونی مانگووری ڕوو دەدا.

**تنگستن** / tang(e)stan/: [انگلیسی از سوئدی] *اسم.* تەنگستەن؛ ولفرام؛ توخمی کیمیاوی کانزایی قورس، بە ژمارەی ئەتومی ۷۴ و کێشی ئەتومی ۱۸۳٫۸۵، کە کانزایەکی پتەو و چەکوچخۆرە: **ولفرام**

**تنگنا** / tang(e)nā، ـها/: *اسم.* تەنگی: ۱. تەنگانە؛ بەرتەنگی؛ تەنگەبەری؛ تەنگژەیی؛ شوێنێ کە ژلێوە و کردوکۆشی تێدا ناکرێ

۲. بێ‌دەرەتانی؛ تەنگاوی؛ دژواری و ناخۆشی؛ بار و دۆخێکی نالەبار کە لێ دەرباز بوونی حەستەمە.

▣ به/ در تنگنا افتادن: /کنایی/ کەوتنە تەنگانەوە؛ بێ‌دەرەتان داکەوتن؛ کەوتنە تەنگی؛ تووشی بارێکی سەخت و نالەبار هاتن. هەروەها: **به/ در تنگنا افکندن**

در تنگنا بودن: /کنایی/ لە تەنگانەدا بوون؛ بێ‌دەرەتان بوون؛ لە تەنگیدا بوون ‹برای گذران زندگی در تنگنا بودیم: بۆ رابردنی ژیان لە تەنگانەدا بووین›.

**تنگ‌نظر** / tangnazar، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت.* /مجازی/ ۱. بەرچاوتەنگ؛ وەرەچەمتەنگ؛ کورت‌بین؛ بیرتەسک ۲. سەختگیر؛ دژوارگر * **نظرتنگ**

**تنگ‌نظری** / tangnazarî، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* /مجازی/ بەرچاوتەنگی؛ وەرەچەمتەنگی؛ کورت‌بینی: **نظرتنگی**

**تنگ‌نفس** / tangnafas/: [فارسی/ عربی] *صفت.* /گفتاری/ هەناسەسوار؛ پشووسوار؛ تەنگەنەفەس؛ بە تایبەتمەندی دژواری هەناسەدانەوە.

**تنگ و تا** / tang-o-tā/ ☜ **تک و تا**

**تنگ و ترش** / tang-o-tor(o)š/: *صفت.* تەنگ و تورش؛ تەنگ و ترووسک: ۱. تەنگ و خەف؛ جێگەی کەم دەرەتان و دڵگیر ‹دو اتاق تنگ و ترش داشت که تویشان نمی‌شد تکان خورد: دوو دیوی تەنگ و تورشی بوو کە نەدەکرا لە ناویاندا بجوولیەوە› ۲. زۆر تەنگ؛ زۆر تەسک (بۆ جل و بەرگ دەگوترێ) ‹پیراهن تنگ و ترش: کراسی تەنگ و ترش›.

**تنگه** / tange، ـها/: *اسم.* تەنگە: ۱. /جغرافیا/ تەنگەلان؛ کەل؛ ناوتەنگ؛ باریکە ئاوێ کە دوو وشکاتی لێک دادەبڕێ ۲. /قدیمی/ سکەی زێڕی ئاسیای ناوەندی.

**تنگی** / tangî/: *اسم.* تەنگی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی تەنگ بوون ‹تنگی جا: تەنگی جێ› ۲. /ـها/ دژواری؛ سەختی؛ گرفتی ‹دست‌تنگی: دەس‌تەنگی›.

▣ تنگی قافیه: *صفت.* /کنایی/ ناچار؛ ناچاری؛ ناگوزیری.

تنگی نفس: تەنگەنەفەسی؛ هەناسەسواری؛ پشووسواری؛ نەخۆشی ئاسم.

**تن و توش** / tan-o-tûš/: *اسم.* /ادبی/ تەن و تووز؛ تووز؛ بیچم و قەڵافەت؛ پەیکەر؛ هەیکەل؛ پەیکەرە ‹تن‌وتوش محکم و نیرومندی داشت: تەن‌وتووزێکی پتەو و ئەستووری بوو›.

**تنور** / tanûr، ـها/: [؟] *اسم.* تەنوور؛ تەندوور؛ تەنوورە؛ تەندور؛ ترین؛ تەنور؛ قووڵکەی خڕی ئاگردان بۆ نان‌کردن ‹این نان را تازه از تنور درآورده است: ئەم نانەی تازە لە تەنوور دەرهێناوە›.

**تنور** / tenor/: [فرانسوی از ایتالیایی] *اسم.* /موسیقی/ زیلترین دەنگی پیاو.

**تنوره** / tanûre، ـها/: [؟] *اسم.* ۱. دووکەڵکێشی زۆر گەورە (وەک دوودکێشی گەمیە یان کارخانە) ۲. تەمۆ؛ تەمموورە؛ کونێک کە لەوێوە ئاو بە سەر پەڕەکانی ئاشدا دەڕژێت.

▣ تنوره کشیدن: لوور بوون؛ لوول واردەی؛ خول‌ـ‌خول و پێچ‌ـ‌پێچ (وەک بڵێسە یا دووکەڵ) بەرەو ئاسمان خێزیان.

**تنوری** / tanûrî/: [؟] *صفت.* تەنووری؛ تەندووری: ۱. برژاو لە تەنووردا ۲. برژاو لە بەر تاوی تەنوور بەبێ ئاو یان هەڵم.

**تنوع** / tanavvo'، ـها/: [عربی] *اسم.* جۆراوجۆری؛ چەشناوچەشنی ‹تنوع گیاهان:

۳. حروف همخوان /ء/ و /ع/

همزه و عین در زبان فارسی تلفظ یکسان دارند و در این کتاب با نشانه‌ی /'/ آوانگاری شده‌اند؛ مانند: اَلَم (درد و رنج) و عَلَم (پرچم)؛ که هر دو «'alam» خوانده می‌شوند.

| حرف | نشانه‌ی آوایی | نمونه | آوانگاری |
|---|---|---|---|
| ء | ' | شیء | Šey' |
| أ | | أرز | 'arz |
| ـأ | | مأنوس | ma'nûs |
| ؤ | | رؤیا | ro'yā |
| ئـ | | رئوف | ra'ûf |
| ع | | عَکس | 'aks |
| | | علم | 'elm |
| | | عُرف | 'orf |
| | | عود | 'ûd |
| | | سعید | sa'îd |
| | | فعّال | fa''āl |
| | | وسیع | vasî' |

باید توجه داشت که هجا هیچگاه با واکه (مصوت) شروع نمی‌شود. به عبارت دیگر سَرِ هجا باید حرف همخوان (صامت) باشد. از این روست که صداها اگر در ابتدای واژه قرار گیرند، با همزه (کوتاهترین همخوان از نظر کششی) خوانده می‌شوند. مانند: آسان ('āsān)، آبر('abr)، این ('în)، اِسم('esm) ، او('û)، و اُنس('ons).

# نشانه‌های به کار رفته در این فرهنگ

| نشانه | کاربرد |
|---|---|
| . (نقطه) | پایان سرواژه، پس از جایگاه دستوری |
| ؛ (نقطه‌بند) | بین کلمات و گاهی عبارات مترادف |
| ، (ویرگول) | توقف کوتاه |
| : (دو نقطه) | قبل از ریشه‌ی واژه و برای توصیف |
| [ ] (کروشه) | ریشه‌ی لغت |
| / / (کروشه خوابیده) | حوزه‌ی معنایی |
| ( ) (کمان) | توضیح بیشتر |
| ☜ | ارجاع یک واژه به واژه‌ی دیگر |
| ‹ › | شاهد یا مثال به کار رفته در تعریف‌ها |
| // // | صرف مصدر |
| / / | جدا کردن تلفظ و نشانه‌ی جمع |
| / | یا |
| ❋ | مترادف بودن یک واژه با همه‌ی تعریف‌ها |
| ▣ | زیر مدخل فعلی |
| ◙ | زیر مدخل اسمی |
| ❏ | جدا کردن تعریف مصدرهای لازم و متعدی |
| ! | تعجب، خطاب، تأکید |
| ؟ | پرسش |
| ■ | صفت فاعلی، صفت مفعولی و مصدر منفی، در پایان مصدرها |
| – – | جمله‌ی معترضه |
| – | بین اجزای برخی ترکیب‌ها |

# ج

**ج / c/**: *حرف.* ج؛ نیشانەی پیتی شەشەمی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**ج / ce/**: *اسم.* ١. جێ؛ جیم؛ ناوی شەشەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی ٢. *[مخفف]* و؛ ولام؛ وەرام؛ پەرسڤ ٣. *[مخفف]* بەرگ؛ جلد (یەکەی بژاردنی کتێب و دەفتەر).

**ج ١**: *اسم. [مخفف]* جەمادیولئەوەڵ؛ مانگی پێنجەمی ساڵی کۆچی ـ مانگی.

**ج ٢**: *اسم. [مخفف]* جەمادیوسانی؛ مانگی شەشەمی ساڵی کۆچی ـ مانگی.

**جا¹ / cā/**: *اسم.* جێ؛ جێگە؛ جێگا: ١. /ـها/ شوێن؛ شۆن؛ شۆنی؛ بەشێکی تایبەت لە ئاقارێک ‹کدام جا؟ آنجا: کام جێ؟ ئەو جێگە› ٢. /ـها/ جی؛ جهێ؛ حاس؛ شوێن؛ گوڵە؛ یاگێ؛ یاگە؛ جاگە؛ جهـ ؛ جیک؛ خونج؛ ڕووبەر یان بۆشاییەک بۆ شتێ ‹جای ایستادن: جێگەی ڕاوەستان› ٣. هەل؛ کات؛ وەخت؛ دەرفەت یان بار و دۆخی بەجێ ‹حالا جای این بحثها نیست: ئێستا جێی ئەم قسە و باسانە نیە› ٤. شوێن؛ شۆپ؛ شوێنەوار؛ نیشانە؛ لێز؛ شۆنەمەی؛ شۆنەما؛ نیشانێ ‹جای پا؛ جای چرخ: جێ پێ؛ شوێنی چەرخ› ٥. یاگێ؛ یاگە؛ چۆناوچۆنی دێران؛ گونجیان؛ گونجان؛ دارەی ‹جا گرفتن؛ جا نداشتن: جێ گرتن؛ جێ نەبوونەوە› ٦. /ـها/ *[گفتاری]* جێ خەون؛ جێوبان؛ یاگەوبان؛ یاگێ ‹جا انداختم، گرفت خوابید: جێگەم داخست و بۆی نووست› ٧. جیاتی؛ بری؛ باتی؛ زانەویر؛ یاگە ‹به جای پول پارچه داد: به جیی پاره پارچەی دا› ٨. پلە؛ پایە؛ یاگێ؛ یاگە ‹جای ارباب را گرفته بود و امر و نهی می‌کرد: جێی خانی گرتبوو، میری ئەکرد› ٩. کولێن؛ کولانە؛ کولینی؛ شوێنی باڵندەی دەستەمۆ ‹مرغها جا رفتند: مریشکەکان چوونە کولانەوە›.

◙ **جای دنج**: کونج؛ دنج؛ کپەنە؛ چۆڵگە؛ جێی مەند؛ جێی چۆڵ و بێدەنگ.

◘ **جا آمدن** ☜ حال کسی جا آمدن، **حال**

**جا افتادن**: ١. داکەوتن؛ داکەفتن؛ لە بیر چوونی وشە، ڕستە یان بەشێ لە نووسراوەیەک لە کاتی نووسیندا ‹در اینجا چند جمله جا افتاده است: لێرەدا چەن ڕستە داکەوتووە› ٢. جێ‌کەوتن؛ جاکەفتن؛ چوونە جێ؛ نیشتن؛ جێی خۆگرتنەوە ‹اول باید پیچ سرجایش جا بیفتد: دەبێ لە پێشدا پێچەکە بنیشێتە سەر جێگای خۆی›؛ **جا رفتن** ٣. ڕاهاتن؛ پێی داکەوتن؛ جێگیربوون لە شوێنێکی تازەدا و ئیتر دامەزران ‹او در این کار جا افتاد و ماندگار شد: ئەو لەگەڵ ئەم کارەیدا ڕاهات و مایەوە› ٤. ڕینگ بەردان؛ تام دانەوە؛ ڕینگ پێکەی ‹شعله را کم

کن تا آرام بجوشد و خوب جا بیفتد: گرەکەی کەم کەوە با لە سەر خۆی بوکلێ و ڕینگ بەردا›.

**جا انداختن:** ١. جێ هێشتن؛ داخستن؛ پەڕاندن؛ پڕنەی؛ ئاسەی جگا؛ وسەیرە؛ فەرامۆش‌کردنی وشە، ڕستە یان بەشێ لە نووسراوەیەک لە کاتی خوێندن یان نووسیندا ‹یک کلمە را جا انداخت: وشەیەکی جێ هێشت› ٢. جێ خستن؛ خستنە جێ؛ گرتنەوە؛ بەردەیوە/ وسەیوە یاگێ؛ شتێ بردنەوە سەر جێگەی خۆی ‹انگشتم دررفتە بود، دکتر جا انداخت: قامکم لە جێ چووبوو، دوکتۆر خستیەوە جێ› ٣. جێگە داخستن؛ جێگە ڕاخستن؛ یاگێ وستەیرە؛ یاگەرە وسەی ‹جایش را بینداز بخوابد: جێگەکەی بۆ داخە با بخەوێ›.

**جا باز کردن:** جێ‌کردنەوە: ١. جێ باز کردن؛ جێگای پێویست بۆ خۆ وەگیر خستن ‹قدری کە بپوشی جا باز می‌کند: نەختێ لە بەری کەی جێ ئەکاتەوە› ٢. *[کنایی]* جێی خۆکردنەوە؛ وەرگیردران یان پەسند کران لە لایەن کەسێ یان تاقمێکەوە ‹بە زودی در کارخانە برای خودش جا باز کرد: زۆر زوو لە کارخانەدا جێی خۆی کردەوە› ٣. جێ‌کردنەوە؛ دڕن دان ‹برایش جا باز کردیم نشست: جێمان بۆی کردەوە دانیشت›.

**جا تر بودن و بچە نبودن:** *[کنایی]* مەڕ نەبوون لە پەرێزێ، پشکەڵ دیتن لە هەوێزێ؛ جێ بێ جێدار مان؛ جێ وە جێ مان؛ نەبوونی کەس یان شتی ڕەچاوکراو ‹وقتی برگشتم، دیدم جا تر است و بچە نیست، ماشین را در غیاب من بردە بودند: کاتێک هاتمەوە، مەڕ نەبوو لە پەرێزێ، پشکەڵم دی لە هەوێزێ، لە نەبوونمدا ماشینەکەیان بردبوو›.

**جا تنگ کردن:** جێ داگرتن؛ جێ‌گرتن؛ جێگا تەنگ‌کردنەوە؛ جێگە داگیر کردن ‹این تلویزیون کار نمی‌کند و فقط جا تنگ کردە است: ئەم تەلەڤیزیونە کار ناکا و هەر جێی داگرتووە›.

**جا خوردن:** *[مجازی]* سەر سوورمان؛ واق‌وڕمان؛ جەنقین؛ مات بوون؛ ئەرەمەنەی؛ زۆر پێ سەیر بوون ‹مرا کە دید خیلی جا خورد: کە چاوی بە من کەوت، سەری سوورما›.

**جا خوش کردن:** *[گفتاری]* بنە بۆ خستن؛ پەسا داخستن؛ پاڵ دانەوە؛ داکوتان؛ جێ خۆش کردن؛ کوایرە؛ شوێنێک پەسندکردن و تێیدا مانەوە ‹خوب تو پاریس جا خوش کردە است: باش لە پاریسدا پەسای داخستووە›.

**جا دادن:** جێ‌کردنەوە: ١. گونجاندن؛ خونجاندن؛ یاگەوەکەردەی ‹این را هم توی کیفت جا بدە: ئەمەش لە نێو کیفەکەتدا جێ بکەرەوە› ٢. وەرگرتن؛ جێ بۆ کردنەوە؛ ڕێدان؛ ڕا دەی؛ لە شوێنێ وەرگرتن ‹مرا هم در جمعتان جا بدهید: منیش لە ناو خۆتاندا جێ بکەنەوە›.

**جا داشتن:** جێ هەبوون: ١. جێگا بوون ‹ماشین برای تو هم جا دارد: ماشینەکە بۆ تۆیش جێی هەیە› ٢. *[مجازی]* جێگەی خۆ بوون؛ شیاو بوون ‹جا دارد از او تشکر کنیم: جێگەی خۆیەتی سپاسی لێ بکەین› ٣. دێران؛ دارەی؛ جێ بوون؛ گرتن ‹این کیسە دیگر بیش از این جا ندارد: ئەم دەوانە لەمە زۆرتر نادێری›.

**جا رفتن** ☜ **جا افتادن-٢**

**جا زدن:** ١. *[مجازی]* لە قەڵەم دان؛ کردن؛ شتێ بە جێی شتێکی‌تر ناساندن ‹او خودش را پلیس جا زد و رفت توی سالن: ئەو خۆی پۆلیس لە قەڵەم دا و چووە نێو هۆڵەکەوە› ٢. فسانەوە؛ فسیانەوە؛ فس خواردن؛ فس دادان؛ کێشانە دواوە؛ چۆک دادان؛ پاشگەز بوونەوە؛ کشانەوە؛ جێ خاڵی کردن ‹او زیاد هارت و پورت می‌کرد، اما زود جا زد: زۆر کشەوفشەی دەکرد بەڵام زوو کێشایە دواوە›.

**جا شدن** ☜ **جا گرفتن-١**

**جا کردن**: ١. جێ/ جێگەکردنەوە؛ گونجانـدن ‹این را هم در جیبت جا کن: ئەمیشە لـە گیرفانتـدا جێ بکەوە› ٢. جێی خۆکردنەوە؛ تێڕۆ چـوون ‹خودش را در آن جمع جا کرد: لـەو کـۆڕەدا جێـی خۆی کردەوە›.

**جا گذاشتن**: جێ هێشتنەوە: ١. مەودا دانـان؛ ناوبڕ دانان؛ بەین خستن؛ چەرت دانـان ‹بین یادداشتها دو سطر جا بگذار: لە نێو نووسراوەکان دوو دێڕ جێگـا بهێـڵەوە› ٢. لـە بـیر چـوون؛ هـل بۆرین؛ ئاسەی جگا؛ لە شتێ گەڕان و ڕۆیـین (بە ئاسایی و بە بۆنەی لە بیرچوونەوە) ‹کیفم را در خانەی شما جا گذاشتم: کیفەکەم لە ماڵی ئێـوە بـە جێ هێـشت› ٣. *[گفتاری]* بـە جـێ هێـشتن؛ خستنە بەر؛ دانە بـەر شـتێکدا؛ ئاسـەی جگـا ‹تـوی اتوبـان همـەی ماشـینها را جـا گذاشـت: لـە شارێگەکەدا هەموو ماشێنەکانی بە جێ هێشت›.

**جا گرفتن**: ١. جێ بوونەوە؛ گونجیان ‹در اینجا بیست نفر جا می‌گیرد: لێـرە بیـست کـەس جێیـان دەبێتەوە›: **جا شدن** ٢. جێ‌گرتن؛ جێ دابـین کردن ‹از دە روز پیش در مسافرخانە جا گرفتە بـودم: لـە دە ڕۆژ پێـشەوە لـە مـسافرخانەکـەدا جـێم گرتبوو› ٣. جـێگیر بـوون؛ جـێ بوونـەوە ‹اول بگذار من جا بگیرم بعد تو بیا: جـارێ ڕاوەسـتە مـن جێگیر ببم ئەوجار تۆ بێ›.

**جا گرم کـردن**: *[مجازی]* جـێ‌خـۆش کـردن؛ پاڵدانەوە؛ جێگیر بوون ‹تازە جایم را گـرم کـردە بودم کە گفتند: پاشـو راه بیفـت: تـازە جـێم خـۆش کردبوو گوتیان: هەستە ڕێ‌کەوە›. هەروەها: **جا گرم شدن**

**جا ماندن**: بەجێ مان: ١. جێ‌مان؛ جێ مەنن؛ مانەوە؛ قەمان؛ مەنەی جگا؛ بەجێ مـان و لـە بیر چوون ‹عینکم روی میز جا ماند: چاویلکەکـەم لـە سـەر مێزەکـە بـە جـێ مـا› ٢. جـێ‌مـان؛ نەگەیشتن بە کەرەستەی ڕاگوێزان ‹قطار رفت و من جا ماندم: قەتارەکە ڕۆیی و من بە جـێ‌مـام›

٣. دواکەوتن؛ کەوتەی دماوە؛ لە دیتـری یـان دیتران دواکـەوتن ‹نوازنـدەی فلـوت چنـد بـار از ارکـستر جـا مانـد: فلـووتژەنەکـە چەنـد جـار لـە ئۆرکێستەکە بەجێ ما›.

**جای چیزی نبودن**: جێی شتێ نـەبوون ‹دیـدم دیگر جای حرف زدن نیست؛ اتـاق کـە جـای فوتبـال بازی کردن نیست: زانیم کە ئیتر جێـی قـسەکردن نیە؛ هۆدە خۆ جێی فووتباڵ کردن نیە›.

**جای خود داشتن**: جێی خۆ بـوون؛ بـۆ ڕووداو یان کارێکی ڕەچاوکراو لەبار و لەباوتر بوون.

**جای سوزن انداختن نبودن**: *[کنایی]* ڕێـی بـە ڕێدار نـەبوون؛ دەرزی داخـستن و نەکەوتنـە زەوی؛ شاندار شـانی سـوان؛ زۆر تەنگـەترێزە بوون بە هۆی زۆری ئاپۆڕەوە ‹توی سـینما جـای سوزن انداختن نبود: لـە سـینەمادا ڕێـی بـە ڕێـدار نەبوو›.

**جای شکر باقی بودن**: جێـی شـوکرانە مانـەوە ‹خانەمان آتش گرفت و سـوخت، امـا جـای شـکرش بـاقی اسـت کـە بـە کـسی آسـیب چنـدانی نرسـید: ماڵەکەمان ئـاگری گـرت و سـووتا، بـەڵام جێـی شوکرانەی ماوەتەوە کەسێک وەزەنگێکی وای پێ نەگەیشت›.

**جای کسی بودن**: لە جێی کەسـێ بـوون؛ بـە جێگەی کەسێک بوون؛ یاگۆ یۆینە بیەی ‹اگر جای تو بودم قبول مـی‌کـردم؛ کـاش جـای او بـودم: ئەگەر لە جێی تۆ بام قەبووڵم دەکرد؛ بریا لە جێی ئەو ببوایەم›: **بە جای کسی بودن**

**جای کسی را تنگ کـردن**: *[کنایی]* جـێ لـە کەسـێ تـەنگ کـردن؛ بـەر دەسـت و پێـی کەسێک‌گرتن؛ تـەنگ لـە کەسـێ هەڵـچنین ‹چکارش داری؟ مگر جای تو را تنگ کردە؟: چتە بە سەریەوە؟ مەگەر جێ لە تۆ تەنگ کردووە؟›.

**جای کـسی را خـالی کـردن**: *[مجازی]* یـادی کەسـێک لـە جێگایەکـدا کـردن؛ جێگـەی کەسێک سەوز کردن؛ بیرکردن لـە کەسـێک

که دەوێدا نیه و ئەگەر ببایە خۆشتر دەبوو ‹دیروز رفتیم کوه، جای تو را خالی کردیم: دوێنێ چووین بۆ کێو، یادتمان کرد›.

**جای کسی را گرفتن:** جێی کەسێ گرتن: ١. جێ لێ داگیرکردن ‹کیفت جای من را گرفته نمی توانم بنشینم: جانتاکەت جێگاکەمی گرتووە ناتوانم دانیشم› ٢. جێی کەسێ گرتنەوە؛ بوونە جێگری کەسێتر ‹یک نفر دیگر جای او را گرفت: یەکێکیتر جێی ئەوی گرتەوە›.

**جای کسی نبودن:** جێگای کەسێ نەبوون؛ شیاوی کەسێ نەبوون؛ بۆ کەسێ نەبوون ‹برویم، اینجا جای ما نیست: با برۆین، ئێرە جێگای ئێمە نیە›.

**جایی را روی سر گذاشتن/ گرفتن:** *[مجازی]* جێگەیەک نانە سەر سەر؛ کردنە حەمەرەمزێ؛ شلۆقوپلۆق کردن؛ هار و هاجی‌کردن؛ جێگایەک نیانە بان سەرەوە؛ یاگێوە ئاردەیوە سەروو دەنگا؛ لە شوێنێک زەنا- زەنا و هەرا و هوریا سازدان ‹بچەها خانە را گذاشته بودند روی سرشان: منداڵەکان لە ماڵەکە کردبوویانە حەمەرەمزێ›.

**جایی رفتن که عرب نی انداخت:** *[کنایی]* لە حەوت کێوان ئاوا بوون؛ بێ سەر و شوێن چوون؛ تووناوتوون کەوتن؛ چوونە جێگایەکی پڕ مەترسی و بێ‌گەڕانەوە.

**از جا پریدن:** ١. ڕاچڵەکان؛ داچڵەکان؛ داچەڵەکیان؛ ڕاچەنین؛ هەڵبەزیان؛ چڵەکیایرە؛ داخورپیان لە ڕووداوێ (وەکوو ترس، توورەیی یان سەرسووڕمان) ‹با صدای زنگ از جا پریدم: بە زڕەی زەنگەکە ڕاچڵەکام› ٢. گورج هەستان؛ خێرا هەڵسان؛ ڕاپەڕین؛ وزاق‌دان؛ پڕتافیەی ‹از جا پرید و گوشی تلفن را برداشت: گورج هەستا و تەلەفۆنەکەی هەڵگرت›.

**از جا دررفتن:** ١. *[گفتاری]* ئاگرگرتن؛ ئاگر تێ بەربوون؛ گڕ لێ بەربوون؛ هەڵچوون؛ هەڵپفان؛ زۆر قەڵس بوون ‹وقتی این حرف را زدم، از جا در رفت و داد و فریاد کرد: کاتێک ئەم قسەیەم کرد، ئاگری تێ‌بەربوو، قیراندی› ٢. لە جێ دەرچوون؛ لە جێگە چوون؛ بە هۆی گوشار یان کوتانەوە لە جێی خۆ ترازان ‹سر چکش از جایش در رفت، خورد به انگشتم: سەری چەکوچەکە لە جێگە دەرچوو، دای لە قامکم› ٣. لە جێ چوون؛ لە جێگە چوون؛ لە وردەڵە چوون؛ لە گرێژنە چوون؛ لە جێی خۆی ترازانی ئێسکی لەش ‹افتادم کتفم از جا دررفت: کەوتم شانم لە جێ چوو›.

**از جا شدن:** *[ادبی]* توورە بوون؛ قەڵس بوون؛ دە ڕکەوە چوون؛ ڕق هەستان؛ ڕکین بوون؛ خەیدین؛ خەزرین؛ خەنزرین.

**از جا کندن:** هەڵکێشان؛ هەڵکەندن؛ لە جێ دەرهێنان ‹باد چند درخت را از جا کند: با چەند داری هەڵکێشا›.

**از جایی آب خوردن:** *[کنایی]* لە جێکەوە سەرچاوکەگرتن ‹می‌دانیم این حرف و حدیث‌ها از کجا آب می‌خورد: دەزانین ئەم قسە و باسانە لە کوێوە سەرچاوکە دەگرن›.

**بە جا آوردن:** *[گفتاری]* ناسینەوە؛ بەجێ هێنان؛ ئژناسەی؛ وێناکەردەی ‹حالش خیلی بد بود و کسی را به جا نمی‌آورد: حاڵی زۆر خراپ بوو، کەسی نەدەناسیەوە›.

**بە جا گذاشتن:** بە جێ هێشتن؛ دانیان؛ ئاسەی جگا ‹از خودش ثروت زیادی به جا گذاشت: ماڵ و داراییەکی زۆری لە خۆ بە جێ هێشت›.

**بە جای کسی بودن** ☜ **جای کسی بودن**

**جا-**[۲]: *پیشواژە.* جێ-؛ جێگە-؛ یاگە-؛ جە-؛ کەرەسەیەک بۆ دانانی شت لە سەر یان لە نێویدا ‹جازغالی: جایخی: جێ‌خەڵووز؛ جێ‌سەهۆڵ›.

**جاافتادگی** / cā'oftādegî/: *اسم.* ١. دۆخ یان چۆنیەتی کەوتنەوە جێ؛ چوونەوە سەر جێ؛ ڕۆینەوە سەر جێ؛ گیریانەوە ‹جاافتادگی مفصل:

چوونەوە جێی جمگە› ۲. /ـها/ لێ داکەوتوویی؛ ئەو بەشەی نووسراوە کە لە کاتی نووسیندا لە بیر کراوە ‹این مقاله در دو جا یک کلمه و در جای دیگر یک جمله جاافتادگی دارد: ئەم وتارە لە دوو جێگەوە وشەیەک و لە جێگەیەکی دیکەوە ڕستەیەکی لێ داکەوتووە›.

**جاافتاده** / cā'oftāde/: *صفت.* ۱. /ـ ها/ داکەوتوو؛ لە بیرچووگ؛ فەرامۆش‌کراو لە کاتی نووسین یان وتنەوەدا ‹جملەی جاافتاده: ڕستەی داکەوتوو› ۲. *[گفتاری]* جێ‌کەوتوو؛ پوختە ‹مرد جاافتاده: پیاوی جێ‌کەوتوو› ۳. باش کولاو؛ جاکەفتی؛ ڕینگ‌بەرداو ‹خوراک جاافتاده: خواردەمەنی ڕینگ‌بەرداو›.

**جابجا**[1] / cābecā/: *صفت.* جاوەجا؛ جابەجا؛ جێوەجێ؛ یاگەبەیاگە؛ یاگەوارِ؛ تووش جێ‌گۆڕکێ بووگ.

◘ **جابجا شدن**: جێ‌وەجێ بوون؛ جێگە بە جێگە بوون؛ جاوەجا بین؛ جا وەز بین؛ یاگەوارِ بیەی؛ لەجێی خۆ ترازان؛ گۆڕانی جێگەی سەرەتایی شتێک ‹کتابها جابجا شده بود: کتێبەکان جێ‌وەجێ ببوون›.

**جابجا کردن**: جێگە بە جێگەکردن؛ جاوەجا کردن؛ یاگەوارکەردەی؛ هەلانین؛ هلاندن؛ جێی شتێ گۆڕان ‹میز را جابجا کرده بود: مێزەکەی جێگە بە جێگە کردبوو›.

**جابجا**[2]: *قید.* ۱. لەملاولاوە؛ لەم لا و لەو لاوە؛ ئەملا و ئەولا؛ ناوەـناوە ‹لباسش جابجا پاره بود: جلەکانی لەملاولاوە دڕابوو› ۲. دەم و دەس؛ دەسبەجێ؛ جێبەجێ؛ جاوەجا؛ جاوەرجا؛ لە جێوە؛ لەپڕا؛ لەپڕتا؛ لەنکاو؛ لەناکاو؛ کوت‌وپڕ ‹جابجا افتاد و مرد: جێبەجێ کەوت و مرد›: **جادرجا**

**جابجائی** / cābecā'î/ ☜ **جابجایی**

**جابجایی** / cābecāyî ، ـها/: *اسم.* ۱. جێبەجێیی؛ جاوەجایی؛ دۆخ یان باری گۆڕانی جێی شتێ ‹جابجایی مهرەها: جاوەجایی مۆرەگەل› ۲. جێ‌گۆڕکێ؛ یاگەوارِێ؛ کار یان ڕەوتی گۆڕانی جێ یان ئاستی شتێ ‹جابجایی مقامها: جێ‌گۆڕکێی لێپرسراوان› ✱ **جابجائی**

**جابر** / cāber ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* چەوسێنەر؛ ناحەقیکار؛ زاڵم؛ ستەمکار؛ گووجکار؛ زۆروێژ.

**جابرانە**[1] / cāberāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* چەوسێنەرانە؛ ستەمکارانە؛ زاڵمانە؛ بێ‌بەزەییانە؛ گووجکارانە ‹رفتار جابرانە؛ قانون جابرانە: ئاکاری چەوسێنەرانە؛ قانوونی ستەمکارانە›.

**جابرانە**[2]: *قید.* ستەمکارانە؛ بە زۆرداریەوە ‹با مردم جابرانە رفتار می‌کردند: لەگەڵ خەڵکیدا ستەمکارانە دەجووڵانەوە›.

**جاپا** / cāpā ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* جای پا ☜ **جا**[1]**ـ۴**

**ـجات** / cāt/: [از عربی] پسوند. ـگەل؛ ـ وات؛ ـیەل؛ ـئەمەنی؛ نیشانەی کۆی دەستە یان پێل، لە وشەگەلی بە پیتی دەنگدار بڕاوەدا ‹روزنامەجات؛ سبزیجات؛ ادویەجات؛ عملەجات: ڕۆژنامەگەل؛ سەوزەوات؛ مزرەمەنی؛ کرێکاریەل›.

**جاتکمە** / cātokme ، ـها/: [فارسی/ ترکی] *اسم.* جێ‌دوگمە؛ جادگمە؛ جادکمە؛ کونێک یان گەزرکێ کە دوگمە لە کاتی بەستنەوەدا ئەچێتە نێویەوە: **جادکمە؛ جادگمە**

**جاـجو** / cācû/: *اسم. [گفتاری]* جێ وشوێن؛ ڕێ‌وشوێن؛ شۆن‌وبەر؛ جێگە؛ ڕێ‌وجێ؛ یاگە؛ یاگێ؛ شوێن، بەتایبەت شوێنی نیشتەجێ یان هێورین لە جێگایەک بۆ تێدا ژیان ‹جاـجوی درستی نداشت؛ بگرد، جاـجویش را پیدا کن: جێ و شوێنێکی باشی نەبوو؛ بگەڕە، ڕێ‌وشوێنی بدۆزەوە›.

**جاجیم** / cācîm ، ـها/: [فارسی/ ترکی] *اسم.* ۱. بەرمالک؛ جاجم؛ جاجرم؛ جاجمە؛ وەپێچی؛ دوگردی؛ تەنراوێکە لە بەنی ڕێسراو و ڕەنگ‌کراو ۲. مەوج؛ مەوجە؛ جۆرێ جاجمی گەورە بۆ

جل‌وبان تێوه پێچان.

**جاخالی** / cāxālî/: *اسم.* *[گفتاری]* جێ‌خاڵی؛ چۆڵایی؛ شوێنێ که شتێ یان کەسێکی تێدا نیه.

⊡ **جاخالی دادن:** خۆ لادان؛ لە بەرانبەر هەڵمەت و پەلامارەوه خۆ کشانەوه ‹جا خالی دادم، مشتش خورد به دیوار: خۆم لادا، مستی دای له دیوارەکه›.

**جاخالی رفتن:** *[مجازی]* جێ‌خاڵیانه چوون؛ دوای چوونه سەفەری کەسێ، بۆ دیتنی بنەماڵەی چوون.

**جاخالی کردن:** *[مجازی]* خۆکێشانەوه؛ له بەرانبەر نەیارەوه هەلاتن ‹من فکر نمی‌کردم به این زودی جا خالی کنی: پێم وا نەبوو بەم زووانه خۆ بکێشیەوه›.

**جادار** / cādār/: *صفت.* جێگەدار؛ جێ‌دار؛ یاگەدار ‹اتاق جادار؛ کیف جادار: ژووری جێ‌دار؛ کیفی جێگەدار›.

**جادرجا** / cādarcā/: [فارسی/ ترکی] ☜ **جابجا**[2]_ ٢

**جادکمه** / cādokme/: [فارسی/ ترکی] ☜ **جاتُکمه**

**جادگمه** / cādogme/ ☜ **جاتُکمه**

**جادو** / cādû ، ـها؛ جادوان cādovān/: *اسم.* ١. جادوو؛ نێرەنگ؛ خرس؛ چاچۆڵ؛ کردوکاش بۆ زاڵ بوون به سەرشت و رووداواندا به ئاکار و ئایینی تایبەتەوه ٢. خرس؛ جادوو؛ سیحر؛ چاچۆڵ؛ ئەفسوون؛ نێرەنگ؛ ورته و پرتەی ژێر لێوان و ئایینگەلی بەڕێوەچوو له جادوودا ٣. *[ادبی]* جادووگەر؛ نێرەنگ‌باز؛ سیحرباز؛ بازبەژن؛ چاچۆڵوان؛ جادوەوان.

⊡ **جادو شدن:** تەلیسم بوون؛ جادووکران.

هەروەها: **جادو کردن**

**جادوئی** / cādû'î/ ☜ **جادویی**

**جادوجنبل** / cādûcambal, -canbal، ـها/: *اسم.* *[تعریض]* جادوو؛ سیحر؛ نێرەنگ ‹می‌گفتند داماد را جادوجنبل کرده‌اند: دەیانگوت زاواکەیان جادوو کردووه›.

**جادوگر** / cādûgar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ئەفسوونکار؛ نێرەنگ‌باز: ١. سیحرباز؛ جادووگەر؛ جادووکەر؛ جادووباز؛ چاچۆڵوان؛ جادوەوان؛ جادووبەند؛ دووایه؛ دوواباز ٢. *[مجازی]* کەسێ که به جوانی، ئاکار یان وتاری خۆی، کاریگەریەکی زۆر له سەر کەسانی‌تر دادەنێ و سەرنجیان رادەکێشێ.

**جادوگری** / cādûgarî ، ـها/: *اسم.* ئەفسوونکاری؛ جادووبەندی؛ جادووگەری؛ سیحربازی؛ کار و کردەوەی چاچۆڵباز.

**جادویی**[1] / cādûyî/: *اسم.* *[ادبی]* نێرەنگی؛ جادووگەری؛ سیحربازی؛ چاچۆڵبازی؛ جادوویی: **جادوئی**

**جادویی**[2]: *صفت.* سیحراوی: ١. نێرەنگی؛ پێوەندیدار یان سەر به جادووەوه ‹چشمانی جادویی داشت: چاوێکی سیحراوی هەبوو› ٢. تایبەتمەندی هەر شتێک که کارێکی زۆر بکاته سەر مێشکی مرۆڤەوه ‹منظرەی جادویی: دیمەنی سیحراوی› ❋ **جادوئی**

**جاده** / cādde ، ـها/: [عربی]*اسم.* ڕێگا؛ ڕێگە؛ ڕێیه؛ ڕیه؛ جاده؛ جاگە؛ کاروانەڕێ؛ ڕەوازێکی ڕووبازی گشتی که بۆ بگاردنی مرۆڤ، گیانەوەران و کەرەسەگەلی ڕاگوێزان، له دەرەوەی شار یان دێ، چێ کراوه.

⊡ **جادەی آسفالته:** ڕێگەی قیرتاو؛ جادەی ئاسفالت.

**جادەی ترانزیتی:** جادەی ترانزیتی؛ ڕێگای تایبەت بۆ هێنان و بردنی کالا و شتومەک له ولاتێکەوه بۆ ولاتێکی‌تر.

**جادەی خاکی:** ڕێگەی خاکی؛ جادەی خاکی.

**جادەی شوسه:** شۆستە؛ شۆسە؛ خیزرێژ؛ ڕێگەی زیخن و چەورێژکراو بۆ هاتوچووی

ماشین.

**جادەی مال‌ڕُو:** کوێرەڕێ؛ ولاخەڕێ؛ قاچاخەڕێ؛ بزنەڕێ؛ کوۆرەڕا؛ تروولەڕێ؛ تروولەڕا؛ ڕێگای باریک و بە کەند و لەند لە چیا و چۆڵ.

**جادەسازی** / cāddesāzî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کار و ڕەوتی خۆش‌کردنی ڕێ و بان؛ دروست کردنی ڕێگا.

**جادەصاف‌کن** / cāddesāfkon، ـها/: [عربی/ از عربی/ فارسی] *اسم.* ڕێ‌خۆشکەر: ١. *[گفتاری]* باگۆردانی ڕێ؛ ماشینێ بە یەک یان چەند غەڵتەکی قورسەوە بۆ پان و ڕێک و لووس کردنی جادە، شەقام یان دەڤەرێک ٢. *[مجازی]* کەسێ کە ببێتە هۆی پێشکەوتن یا سەرکەوتنی کەسێکی‌تر ‹اینها جادە صاف‌کن آمریکا هستند: ئەمانە ڕێ‌خۆشکەری ئەمەریکان›.

**جاذب** / cāzeb/: [عربی] *صفت. [نامتداول]* ڕاکێشەر؛ کێشنە؛ کێشەر؛ بە تایبەتمەندی یان لێهاتوویی ڕاکێشان ‹جاذب رطوبت: نم ڕاکێشەر›.

**جاذبە** / cāzebe، ـها/: [عربی] *اسم.* ڕاکێشی؛ ڕاکەشی: ١. کێشەری؛ ڕاکێشەری؛ تایبەتمەندیەک لە بڕێ تەندا کە تەنگەڵی‌تر بەرەوخۆ ڕادەکێشێ ‹جاذبەی مغناطیسی: ڕاکێشی مەگنەتیکی› ٢. چاوگری؛ تایبەتمەندی یان بار و دۆخێک لە شتێ یان کەسێکدا کە سەرنج یا هۆگرەتی بەرەو خۆ دەبا ‹جاذبەی جنسی: ڕاکێشی جینسی› ٣. سەرنج‌ڕاکێشی؛ سەرنجبەری؛ ئەوەی سەرنج ڕاکێشە ‹جاذبەهای توریستی: ڕاکەشیگەلی گەشتیاری› ٤. *[فیزیک]* ئەو هێزە کە لە پاژگەلی تەنێکدایە و دەبێتە هۆی ڕاکێشان لە نێوانیاندا و ناهێڵێ لێک بنەوە ٥. هێزی ڕاکێشی؛ تایبەتمەندی بەرەو خۆ ڕاکێشانی زەوی.

▣ **جاذبەی جنسی:** ڕاکێشی جنسی؛ چۆنیەتیەک لە بڕێ ژن یان پیاودا کە ئەبێتە هۆی ڕاکێشانی لفیان.

**جاذبەی زمین:** ڕاکێشی زەوی؛ هێزێکی ناو دڵی زەوی کە هەموو شتێک بەرەو خۆی ڕادەکێشێ.

**جاذبەی مغناطیسی:** ڕاکەشی مەگنەتیکی؛ هێزی تەنگەلی میغناتیسی کە بڕێ کانزا (بەتایبەت ئاسن) بەرەو خۆ ڕادەکێشن.

**جار** / cār، ـها/: *اسم.* ١. [هندی] *[ـها/ قدیمی]* چل‌چرا؛ چرای گەورە و هەڵواسراو بە سەرمیچی ماڵانەوە ٢. [ترکی] چێر؛ هەڕاڵە؛ هەلالە؛ بانگەواز؛ بانگاواز؛ جاڕ؛ هەواڵێ کە بە دەنگی بەرز ڕادەگەیندرێ.

▣ **جار زدن:** قاڵ داخستن؛ قوو داخستن؛ قاڵ دەرخستن؛ نهێنی دەرخستن؛ بانگەوازکردن؛ دەنگدان؛ دانەدەوڵ؛ جاڕدان ‹رفت و همە جا جار زد کە فلانی ورشکست شدە: ڕۆیشت و قالی داخست کە فلانی کەساس بووە›: **جار کشیدن**

**جار کشیدن:** ١. بانگەوازکردن؛ جاڕ کێشان؛ قاڵ داخستن؛ دەنگدان ‹جارچی در کوچەها جار می‌کشید: چێرڤان لە کۆڵانەکاندا بانگەوازی دەکرد› ٢. ☜ **جار زدن**

**جارچی** / cārčî، ـها؛ ـان/: [ترکی] *اسم. [قدیمی]* چێرڤان؛ جارچی؛ ڕاگەیێنەر؛ ئاگەکەر؛ قاڵکەر؛ کەرنەلیاس؛ کەسێ کە بە دەنگی بەرز، لە ڕێ و باناندا هەواڵێکی دەگوتەوە کە هەموان بیبیسن.

**جارختی** / cāraxtî، ـها/: *اسم.* ١. جێگەی جل‌وبەرگ ٢. جلاوێز؛ چێو لیباسی ‹کت را بە جارختی آویزان کن!: کۆتەکەت بە جلاوێزەکەوە هەڵواسە!›.

**جارو** / cārû، ـها/: *اسم.* گسک؛ گەسک؛ گەز؛ گەزک؛ گزک؛ گزگ؛ گزی؛ گزی؛ گێزگ؛ گێسک؛ گێزی؛ کێزی؛ کنۆشە؛ کونۆشە؛ هاڤلیک؛ هیڤالەک؛ جاڕوو؛ گیاریفک؛ شفیک؛ سفیک؛ جەڕیفک؛ کەرەسەیەک کە خاک و خۆڵ و شەخەڵی پێ ڕادەماڵن: *الف)* چەپکێک

لاسکی وشکی بڕێ گیا (وەک ڕاواوە و گیاگزگ) کە بۆ ئەو مەبەستە پێکەوە بەسراون ب) دەستەیەک ڕیشاڵی نایلۆنی پێکەوە بەسراو بۆ کارێکی وا.

▣ **جارو کردن:** گەسک لێدان؛ گەسکدان؛ گسک لێدان: ١. گزیدان؛ گزگدایەن؛ گزیدەی/ دای؛ گزێ دایەن؛ ماشتنەوە؛ ماشینەوە؛ جاڕووکردن؛ گەزکەردش ‹اتاق را جارو کرد: هۆدەکەی گەسک دا› ٢. *[کنایی]* تەواو ڕاماڵین و هیچ نەهێشتنەوە ‹دزدها خانه را جارو کرده بودند: دزەکان ماڵەکەیان گەسک لێدابوو›.

هەروەها: **جارو شدن**

**جاروبرقی** / cārûbarqî ، ـها: [فارسی/ عربی]/*اسم*. گەسکیبەرقی؛ گزگ بەلاچی؛ ئامرازێک کە بە هێزی کارەبا و بە هەڵمژینەوە، زبڵ و زاڵ کۆ دەکاتەوە.

**جارو-پارو** / cārûpārû: /*اسم*. *[گفتاری]* گسک و ماڵ ‹دیروز از صبح مشغول جارو-پارو بودیم: دوێنێ هەر لە بەیانیەوە خەریکی گسک و ماڵ بووین›.

**جاروجنجال** / cār-o-cancāl ، ـها: [ترکی/ فارسی]/*اسم*. هەراوهوریا؛ هەراوهاوار؛ گوڕەوهەرا؛ هەیتەهەیت؛ چەقەوهەرا؛ هەلەبەل؛ قوولاقوول؛ شەڕهۆمللێ؛ شەماتە؛ دەنگودۆر؛ هەرەومەزات؛ زلەزل؛ زەنا_ زەنا؛ گالەگاڵ؛ هەللا_ هەللا؛ چەقەچەق؛ چەقەوهەرا؛ گوڕەوچەقە؛ گرموقاڵ؛ قرەومشە؛ قرموقاڵ؛ قیڕەقیڕ؛ هەرا و قیرین؛ هەرا و هۆسەیەک کە بە هۆی کێشەوە پێکدێت ‹ببین چه جاروجنجالی راه انداختەاند: بزانە چ هەرا و هوریایەکیان ناوەتەوە›.

**جاروکش** / cārûkeš ، ـها؛ ـان: /*اسم*. ١. گەسکدەر؛ گزگدەر؛ گزیدەر؛ کەسێ کاری گەسک لێدانە ٢. پاکەوان؛ زبڵڕێژ؛ کەناس؛ کووچەماڵ؛ سپوور؛ کرێکاری شارەداری بۆ خاوێن کردنەوەی شار ٣. *[تعریض]* بێسەر و پا؛ هیچ نەفام؛ دوور لە زانست و شارستانیەت ‹هر جا میروی جاروکشی همەکارە است: هەر کوێ دەچێ بێسەر و پایەک بەرپرسە›.

**جاری**[1] / cārî ، ـها: /*اسم*. هێوەرژن؛ هێوەرژەنی؛ هاوگیان؛ هەوگیان؛ هۆمبێ؛ جاری؛ براژنی مێرد؛ ژنی برای شوو.

**جاری**[2]: [عربی] *صفت*. ١. ڕەوان؛ بەخوڕ؛ وەگەڕ؛ جول ‹آب جاری: ئاوی ڕەوان› ٢. ئەم؛ ئیسە؛ کاتێ کە تێداین؛ پێوەندیدار بە ئێستەوە ‹ماه جاری؛ سال جاری: ئەم مانگە؛ ساڵێ کە تێداین›.

▣ **جاری شدن:** ڕەوان بوون؛ کەوتنە جووڵە؛ وەڕێ کەوتنی تراو. هەروەها: **جاری بودن**

**جاری کردن:** وەڕێ خستن؛ هەڕکاندن.

**جاز** / cāz: [انگلیسی]/*اسم*. جاز؛ جۆرێ مووسیقای گۆرانی کە هەوەڵ جار لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە لە نێو ڕەشپێستەکانی ئەمریکادا بەدی هات و ئێستاکەش مووسیقایەکی جەهانیە.

**جازیست** / cāzîst ، ـها: [انگلیسی]/*اسم*. جازژەن؛ جازیست؛ گۆرانیبێژ یان ژەنیاری جاز.

**جاسازی** / cāsāzî ، ـها: /*اسم*. جێخۆشکەری؛ سەختکاری؛ کار یان ڕەوتی شاردنەوەی شتێک لە شوێنێ نادیار (بەتایبەت لە ناو شتێکیتردا).

**جاست** / cāst ، ـها: [؟]/*اسم*. ئیسر؛ گووشینە؛ گووشینگە؛ جێی گووشین و ئاوگرتنی ترێ.

**جاسنگین** / cāsangîn: *صفت*. *[گفتاری]* ١. جێکەوتوو ‹یک آقای محترم و جاسنگین آنجا بود: پیاوێکی بەڕێز و جێکەوتوو لەوێ بوو› ٢. *[مجازی]* لووتبەرز؛ قاپان؛ دەماراوی؛ ڕۆحزل ٣. بایەخدار؛ گران و بەوەج ‹این خانه چە فرش و اثاثیەی جاسنگینی دارد!: ئەم ماڵە چەند مافوورە و کەلپەلی بایەخداری تێدایە!› ٤. دیرئاخێز؛ دیرخێز؛ لەشگران ‹وزیر بسیار جاسنگین بود و بە ندرت کاری را سرکشی میکرد: وەزیر زۆر دیرئاخێز بوو، بە دەگمەن سەری لە کارێک بدایە›.

**جاسوس** / cāsûs ، ـها؛ ـان؛ جَواسیس *[نامتداول]*:

[عربی]/اسم. شــووفار؛ شـۆفار؛ شۆڤــار؛ ســیخوڕ؛ جاســووس؛ پــاپی؛ زیــرەوان؛ زیــرەوا؛ زیــران؛ زوانگیر؛ خەبەربەزێن؛ هەواڵدز؛ تێچێن؛ گزمە.

▣ **جاســوس دوجانبــه**: شــۆفاری دوولایەنــە؛ سیخوڕی دولایەنە؛ شووفارێ کە بۆ هــەر دوو لای دوژمنی یەک شۆڤاری دەکا.

**جاسوسی** / cāsûsî ، ـها/: [عربی]/اسم. شـووفاری؛ شـۆفاری؛ شۆڤــاری؛ دەسکیــسی؛ جاسووســی؛ زیــرانی؛ گوهبــەلی؛ گوێبــەلی؛ گۆبــەلی؛ گوێبیسی؛ کار و ڕەوتی کۆ کردنەوەی خەبەر و زانیاریگەلی پێویست بە شێوەی نهــێنی ‹معلـوم شد برای دشمن جاسوسی می‌کند: دەرکەوت بۆ دوژمن شوفاری دەکا›.

**جاسـویچی** / cāsuvîčî ، ـهـا/: [فارسـی/ انگلیـسی] اسم. جێ‌کلیلی؛ جێ‌کلیلی.

**جاسیگاری** / cāsîgārî ، ـها/: [فارسی/ فرانسه]/اسم. ۱. جێ‌سیگاری؛ قوتووی سگار؛ قوتووی جگــەرە ۲. ژێرسیگاری؛ ژێرسگاری؛ چێرجگەرە.

**جاشو** / cāšû ، ـها؛ ـان/:/اسـم. جاشــوو؛ کرێکــاری کەشتی؛ کاریگەری گەمیە.

**جاشیر** / cāšîr/:/اسم. لۆ؛ هەلز؛ هەلــس؛ هەلــەز؛ هەلیز.

**جاعل** / cā'el ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. ســاختەچی؛ دەغەلکار؛ بەلگەســاز؛ کەســێ کــە بەلــگەی لــە قەستی ساز دەکا.

**جاکتابی** / cāketābî ، ـهـا/: [فارسـی/ عربـی]/اسـم. ۱. قەفــــەزەی کتێــــب؛ ڕکــــەی پــــەرتووک؛ جێ‌کتێبی؛ هــۆدەکی کتێبــان ۲. جــێ‌کتێــب؛ جێ‌کتێوی؛ ڕەفەیەک لە ژێر مێزەوە بــۆ دانــانی کتێب و دەفتەر.

**جاکش** / cākeš ، ـهـا/:/اسم. [مـستهجن] گــەواد؛ قــەواد؛ قەلــتە؛ قەلــتەبان؛ دەویــت؛ دویــت؛ ســیغەچی؛ قوڕمــساخ؛ قوڕمــساق؛ ماســکەش؛ مەئــەرس؛ کەســێ کــە ژنــانی داوێــن‌پیس بــۆ پیاوانی ناپاک ساز دەکا.

**جاکــشی** / cākešî/:/اسـم. [مـستهجن] گــەوادی؛ قەوادی؛ قوڕمــساخی؛ دەویــتی؛ کــار و پیــشەی گەواد.

**جاکلیــدی** / cākilîdî, -kelîdî ، ـهـا/: [فارسـی/ یونانی]/اسم. جێ‌کلیلی؛ جێ‌کلێل: ۱. جاســویچی ۲. کلر؛ کلیر؛ کونی دەرگا ‹از جاکلیدی نگاه کـردم ببینم کی پشت در است: لــە جــێ‌کلیلیەکــەوە ڕوانــیم بزانم کێ لە پشتی درگاوەیە›.

**جــاکن** / cākan/: صـفت. جێکــەن؛ جێگەکــەن؛ لەبنەوە دەرهاتوو؛ هەلکنراو زۆرتر بــە تــەواوەتی یان بۆ هەمیشە ‹دستم را گرفتم به حلقه، جاکن شد و ماند توی دستم: دەستم گیردایە ئالقەکە، جێکەن بوو و هاتە دەسمەوە›.

**جاکوزی** / cākûzî/: [انگلیسی] ☜ **جکوزی**

**جــــاگیر** / cāgîr/: صــفت. جێگــــر؛ جــــێگیر: ۱. جێگەگر؛ جاگرتێ؛ جیــەوەگر؛ یاگــەگیر؛ بــە بارستایی زۆرەوە ‹این مبلها خیلی جاگیر هستند: ئــەم موبلانــە زۆر جێگــرن› ۲. ســەقامگیر؛ دامــەزراو؛ مەرزیا؛ ئاکنجی ‹بزودی در آن خانه جاگیر شدند: زۆر زوو لەو ماڵەدا جێگر بوون› ✱ **جایگیر**

▣ **جاگیر بودن**: جێگر بــوون؛ جێــی زۆر گرتنــە بەر.

**جــاگیر شــدن**: ســەقامگیر بــوون؛ نیــشتەجێ بــوون؛ جێگــر بــوون؛ گونجیــان؛ گونجیــای؛ دامەزران؛ دامەرزیان؛ مەرزیایرە؛ لە شوێنێکی لەبار یان دلخواز دامەزران ‹رفتند و در کردستان حسابی جاگیر شدند: ڕۆیشتن و لە کوردستاندا تەواو سەقامگیر بوون›.

**جال** / cāl ، ـهـا/:/اسم. جــاڵ؛ داو؛ دامــی؛ داوی تایبەت بۆ ڕاوی پەلەوەران.

**جالاب** / cālāb/: [؟] ☜ **زالاب**

**جالب** / cāleb/: [عربـی] صـفت. ســەرنجڕاکــێش: ۱. ڕاکێشەر؛ دایلان؛ سەیر؛ ســەمەرە؛ بــە بــار و دۆخێکی وەها کە ببێتە هۆی ســەرنج دان یــان هۆگری خەلک ‹طرز نگـاهش جالـب بـود: شــێوەی

روانینی سەرنجڕاکێش بوو› ٢. بەرچاو؛ چاوگر؛ بایەخدار؛ بەنرخ؛ وەرەچەم؛ خاوەن تایبەتمەندی پڕبایەخ یان شیاوی سەرنج پێدان ‹کار جالبی نیست؛ چیز جالبی نداشت: کارێکی چاوگر نیە؛ شتێکی بەرچاوی نەبوو›.

**جالباسی** / cālebāsî ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. گەنجە؛ جادلنگی؛ جێی جلوبەرگ؛ دۆلاوی گنج؛ هەودەی هەڵگرتنی پۆشەن ‹لباسهایت را اتو کردم، گذاشتم توی جالباسی: جلەکانتم ئوتوو کرد و ناومە نێو گەنجەکەوە›.

**جالیز** / cālîz ، ـها/:اسم. بێسان؛ بێستان؛ کیار؛ جاڕ؛ کێڵگەی تەڕەکاڵ (وەک خەیار، تەماتە، شووتی و...): **پالیز**

**جالیزبان** / cālîzbān ، ـها؛ ـان/:اسم. بێستانەوان؛ بێسانوان؛ خاوەن یان پارێزەری بێسان: **پالیزبان**

**جالیزکاری** / cālîzkārî ، ـها/:اسم. تەڕکاڵی؛ تەڕەکاڵی؛ تەڕەکاری: ١. بێستانکاری؛ کار یان ڕەوتی کێڵانی تەڕەکار ‹قطعه زمینی هم داشت که در آن جالیزکاری می‌کرد: پارچە زەوینێکیشی بوو تەڕکاڵی تێدا دەکرد› ٢. زەوینی بێستان ‹یک وقتی سراسر تهران جالیزکاری بود: سەردەمێک سەر لە بەری تاران تەڕکاڵی بوو›.

**جام** / cām ، ـها/:اسم. ١جام: *[قدیمی]* کاسە؛ قاپ و قاچاق؛ بایە؛ بادیە؛ بادی؛ بابیە؛ دەفرێکی قووڵی زار هەراو کە تراو و تەڕەچێشتی تێدەکەن ٢. *[ادبی]* پەرداخ؛ پیاڵە؛ کاسەیەک کە شەرابی پێدەخۆنەوە ‹جام می: جامی مەی› ٣. شووشە؛ شیشە؛ جۆم؛ گاپەڕەیەک لە شووشە بۆ داپۆشانی دەرگا و باڵین ٤. *[گیاه‌شناسی]* پەڕە؛ پەلکەی گوڵ بەتێکڕایی کە یان پێکەوە لکاون یا جیان ‹جام گل: پەڕەی گوڵ› ٥. کاپ؛ دەفرێکی پیاڵەئاسا بە نەخش و نیگار و پایە و دەستەوە کە بە خەلات دەیدەن بە سەرکەوتووانی کێبەرکێگەلی وەرزشی: **جام پیروزی** ‹جام جهانی؛ جام یوفا: جامی جەهانی؛ جامی یووفا›.

▣ **جام پیروزی** ☜ **جام ـ ٥**

**جامد** / cāmed ، ـها؛ ـات/: [عربی] صفت. خۆگر؛ خۆگرک؛ بەستوو؛ تەندار؛ وشک ‹جسم جامد: ماکی خۆگر›.

**جامدات** / cāmedāt/: [عربی]/اسم. ئەو ماکانەی لە بار و دۆخی ئاساییدا بیچمیان نەگۆڕە (پێچەوانەی گاز و تراو).

**جامدادی** / cāmedādî/: [فارسی/ عربی]/اسم. ١. قەڵەمدان؛ دەفرێک یان قوتوویەک کە قەڵەمی تێ دەنێن ٢. جێقەڵەم؛ درزێ لە کەرەسەیەکی وەک دەفتەر یان کیفدا بۆ دانانی قەڵەم.

**جامع** / cāme'/: [عربی] صفت. ١. کۆ؛ کۆمەڵ؛ کۆمەڵتە؛ خاوەن تایبەتمەندی یان چۆنیەتی کۆوە کردن ‹جامع شرایط: کۆی هەلومەرجان› ٢. کۆبەند؛ کۆگر؛ بەبێ کەموکووڕی ‹فرهنگ جامع؛ طرح جامع: فەرهەنگی کۆبەند؛ گەلاڵەی کۆگر›.

**جامع الاطراف** / cāme'ol'atrāf/: [عربی] صفت. هەمەلایەنە؛ لە خۆگری هەموو لایەنەکانی چەمکی ڕەچاوکراو ‹بحث جامع‌الاطراف: باسی هەمەلایەنە›.

**جامع الشرایط** / cāme'oššarāyet/: [عربی] صفت. خاوەنی هەموو مەرجی پێویست.

**جامع‌العلوم** / cāme'ol'ulûm, -'olûm/: [عربی] صفت. پیتۆڵ؛ خاوەن یان لە خۆگری زانستی زۆر و جۆراوجۆر.

**جامع ومانع** / cāme'-o-māne'/: [عربی] صفت. پڕوپەرداخت؛ خاوەن هەموو پاژ و لایەنی تایبەتی خۆ بێ ئەوەی لەگەڵ شتێکی تردا تێکەڵاو بێ یان بە هەڵەدا بڕوات ‹تعریف باید جامع‌ومانع باشد: پێناسە دەبێ پڕوپەرداخت بێ›.

**جامعه** / câme'e ، ـها؛ جوامع/: [عربی]/اسم. ١. کۆمەڵگا؛ کۆمەڵگە؛ کۆمەڵ؛ جەماوەر؛ گهان؛ بەراقی؛ جوات؛ جڤات؛ جڤینگە؛ ئاپۆرە؛ گوردەم؛

گورتـل؛ دەسـتەیەک لـە تاکـە کەسـان بـە بەرژەوەندی، بنکەگەل و فەرهەنگی هاوبەشـەوە ‹جامعـەی ارمنیـان: کۆمەڵـگای ئەرمـەنیان› ٢. کۆمەڵـە؛ بنکەیـەک کـە بـە هـۆی ئاوەهـا کەسانێکەوە پێک دێ ‹جامعەی شبانی: کۆمەڵـەی شوانی› ٣. کۆمەڵە؛ ڕێکخراوەیەک کە بەدەستی دەسـتەیەک بـۆ گەیـشتن بـە ئامانجگـەلی دیاریکراو پێک دیت ‹جامعـەی معلمان: کۆمەڵـەی مامۆستایان›.

◙ **جامعەی ارادی:** کۆمەڵگایەک کـە ئەنـدامانی بە حەز و خوازیاری خۆیان تێدان.

**جامعـەی اشـتراکی:** کۆمـۆنیزم؛ کۆمەڵـەی هاوبەشی.

**جامعەی باز:** لیبرالیـسم؛ کۆمەڵـگای ئـاوەڵا/ کراوە.

**جامعـەی بـسته:** کۆمەڵـگای بەسـراو؛ کۆمەڵگایەک کە دەگەڵ کۆمەڵگایانی دەور و بەریدا پێوەندی نیە.

**جامعـەی بـیطبقـه:** کۆمەڵـگای بـێچـین؛ کۆمەڵگایەک کە بەهۆی هەمووانی بوونـەوەی کەرەسە و سەرچاوە سروشـتیەکانی، هـەژار و دارای تێدا نەمێنێ.

**جامعـەی سـنتی:** جـەماوەری سـوننەتی؛ کۆمەڵـگای ڕسـتی؛ ئاپۆرەیـەک کـە داب و نەریتی کەونارای خۆی پاراستووە.

**جامعـەی صـنعتی:** کۆمەڵـگای پیـشەیی؛ کۆمەڵگەیەک کە بە پێی پیشەکاری ماشێنی، لە باری ئابووریەوە پێشکەوتووە.

**جامعـەی مـدنی:** کۆمەڵـگای شارسـتانیەت؛ کۆمەڵـگەیەک کـە قـانوونی هەڵـبژاردەی خەڵک، بـە سـەر هەمووانـدا ـ وەک یـەک ـ زاڵە.

**جامعەستیز** / cāme'esetîz ، ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت. [روانشناسی]* دژکۆمەڵ؛ بە ئاکاری پێچەوانە یان دژ بەکۆمەڵگا. هەروەها: **جامعەستیزی**

**جامعەشناختی** / cāme'ešenāxtî/: [عربی/ فارسی] *صفت.* کۆمەڵناسیەوەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کۆمەڵناسیەوە.

**جامعەشـناس** / cāme'ešenās ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کۆمەڵناس؛ کەسێ کە کاری ناسینی تایبەتمەندیگەلی کۆمەڵگایە.

**جامعە شناسی** / cāme'ešenāsî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کۆمەڵناسی؛ زانستێ کـە دەپەرژێتـە سـەر لێکدانەوەی تایبەتمەندیگەلی کۆمەڵگای مرۆڤ.

**جامعە گـسلی** / cāme'egosalî/: [عربی/ فارسی] *اسم. [روانشناسی]* لـەکۆمـەڵ پـساوی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی پچـڕانی پێوەنـدی تـاک لەگـەڵ کۆمەڵگادا، پتر لـە بـەر شـێواوی و ئاڵـۆزی لـە مێشک یان ئاکاردا. هەروەها: **جامعەگسل**

**جامعیـت** / cāme'îyyat/: [عربـی]*اسـم.* پـڕ و پەرداختی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هەمەلایەنە بوون.

**جامـه** / cāme ، ـها؛ ـگان/: *اسم. [ادبی]* گـنج؛ جلوبەرگ؛ پۆشتەنی؛ کووتاڵ؛ سیپاڵ؛ پۆشـەن؛ وەلنگە؛ ئەوەی مرۆ لە بەری دەکا.

◙ **جامەی خواب:** ١. جلی خەو؛ جلی نووسـتن ٢. جێوبان؛ جێگەوبان؛ جل و جێوان.

**جامەدار** / cāmedār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* حـەمامچی؛ حومـامچی؛ حمـامچی؛ کاریگـەرێک کـە لـە گەرماوە گشتیەکاندا جلوبـەرگی گەرماوکـەران هەڵدەگرێ.

**جامـەدان** / cāmedān ، ـهـا/: *اسـم.* ١. بـاوڵ؛ سـندۆق؛ چەمـەدان؛ جانتـا؛ جامتـا ٢. یـەغان؛ یغان؛ یەغدان.

**جامیزی** / cāmîzî ، ـها/: *اسم.* جێ کتێبی.

**جان**[1] / cān/: *اسم.* گیان: ١. ـها/ گێـون؛ جـان؛ ژیان؛ هێزی ژیان و جوولانی گیانەوەر ٢. ـها/ ژیـان؛ ئـەو بەشـە لـە هـەبوونی مـرۆڤ کـە تێ‌گەیین، ناسین، ئاگـایی و هـەموو هەسـتێک دەگرێتـە بـەر ٣. *[مجـازی]* پوختـە؛ کاکـڵە؛ ناوەرۆک ‹جان کلام: پوختەی مەبەسـت› ٤. ژیان؛

گۆن ‹جان دادن: گیـان دان› ٥. *[ادبی]* ڕۆح؛ ڕەح؛ ڕح؛ چاو؛ دیده؛ دیه ‹جـان بـرادر: گیـان کاکـەی› ٦. لـەـا/ *[گفتاری]* لـەش؛ ئـەنام؛ تـەن؛ کەلـەخ ‹همەی جـانم درد مـی‌کـند: هـەموو گیانـم دێـشێ› ٧. تەواوی هەبوونی کەسێ یان شتێک ‹جـارو را برداشت و افتاد به جان خانه: گەسـکەکەی هەلـگرت و کەوتە گیان ماڵەکەوە›.

**جان در قالب** ☜ **دوجان در یک قالب**

**جان کسی:** *[گفتاری]* تۆ گیان؛ گیانی کەسێک؛ گیـان؛ سـەر؛ وشـەی سـوێند خـواردن یـان سوێند دان بە گیـانی کەسـێک ‹جـان مـادرت راستش را بگو: تۆ گیانی دایکت ڕاستی بڵێ›.

**جـان کـلام:** *[مجـازی]* کاکـڵەی مەبەسـت؛ پوختەی قسە؛ مەبەست و ئامانجی سـەرەکی وێژەر.

**جان و دل** ☜ **جان‌ودل**

**دو جان در یک قالب:** *[کنایی]* گیانێـک و دوو لەش؛ گیانێک لە دوو جەستەدا؛ دوو دۆسـتی گیـانی‌گیـانی؛ دوو دۆسـتی زۆر نزیـک و هەمیشە پێکەوە: **جان در قالب**

**جان باختن:** *[ادبی]* گیان بەخت‌کـردن؛ گیـان فیـداکردن؛ گیـان لـە دەس‌دان ‹آنـان در راه میهنشان جان باختند: ئەوان لـە ڕێـی وڵاتەکەیانـدا گیانیان بەخت کرد›.

**جان بخـشیدن:** ١. بووژاندنـەوە؛ گەشـاندنەوە؛ ژووژاندنەوە؛ ژیاندنەوە؛ ژیان پێدان؛ ژووژنایەوە؛ بوونـە هـۆی گەشـە و نەشـە و چـالاکی ٢. *[مجـازی]* گیـان تێخـستن؛ ڕۆح پێـدان ‹پیکرتـراش بـە سـنگ و آهـن جـان مـی‌بخـشد: پەیکەرتاش گیان دەخاتە نێو بەرد و ئاسنەوە›.

**جان برکف نهـادن:** *[مجـازی]* گیـان لـە سـەر دەس دانان؛ گیان نانە مست؛ بەرهەڤی گۆری بوون ‹جوانان جان برکف نهادند و از سرزمین خـود دفاع کردند: لاوەکان گیانیان لە سـەر دەس دانـا و بەرەنگاریان لە زێدی خۆیان کرد›.

**جان به جان آفرین تسلیم کردن:** *[ادبی]* گیـان بە دەستەوە دان؛ مردن؛ گیان دان ‹اندکی بعد جان به جان افرین تسلیم کرد: کەمێ دواتـر گیـانی بە دەستەوە دا›.

**جان بـە جـان کـسی کـردن:** *[مجـازی]* گیـان کردنە گیان کەسێکەوە؛ بۆ کەسێ خزمـەت و کردوکۆشی زۆرکردن ‹ئەم نیورستەیە هەمیـشە بە نیوڕستەیەک تەواو دەبێ کە بێ‌کەڵـک بـوونی کارەکە نیشان دەدا› ‹جان به جانش هم بکنـی بـاز دنبال دزدی و الواتی است: گیـان بکەیتـە گیانیـەوە هەر بە دوای دزی و خوێڕیەتیەوەیە›.

**جان بـە دربـردن:** گیـان دەرکـردن؛ خـۆ لـە مەرگ دەربازکردن ‹بسختی توانستم از آن مهلکه جان به در ببرم: ئەستەم توانیم لەو فەرتەنـە گیـان دەرکەم›.

**جان بـە سـر شـدن** ☜ **جـان بـە سـر شـدن، جان‌بەسر**

**جان به عزرائیل ندادن:** *[کنایی]* ئـاو لـە دەس نـەتکان؛ تـۆز لـێ هەڵنەسـتان؛ هـەرزن لـە دەست هەڵنەوەرین؛ گوو وشک‌کردن؛ تـوکڵ تس‌گرتنەوە؛ زۆر ڕژد و دەس‌وشک بـوون ‹او جان به عزرائیل نمی‌دهد، حالا تو می‌خواهی از او پول بگیری: ئـەو نـاو لـە دەسـتی ناتکـی، ئێـستێ تـۆ دەتەوێ پارەی لێ بستێنی›.

**جان به لب رسیدن:** *[مجازی]* گیانەسەر بـوون؛ گیان هاتنە نـووک لـووت؛ بـە هـۆی ڕەنـج و ئازاری زۆر، لە ژیان بێزار بـوون ‹از دست زنـم جانم به لب رسید؛ دیگر جان به لبش رسیده بـود: لـە دەسـتی ژنەکـەم گیانەسـەر بـووم؛ ئیتـر گیـانی هاتبووە نووک لووتی›.

**جان تازه بخشیدن:** گەشـاندنەوە: ١. *[مجـازی]* گیانی تازە خـستنە نێـو لەشـەوە؛ دڵـی تـازە پێ‌بەخشین ‹آمدن تـو بـە همـەی مـا جـان تـازە بخـشید: هاتنـت گیـانیکی تـازەی خـستە نێـو لەشـــمانەوە› ٢. بووژاندنـــەوە؛ ژووژاندنـــەوە؛

ژیاندنەوە؛ ڕزگارکردن لە مەرگ یا لە فەوتان.
**جان خود را کف دست گرفتن:** *[مجازی]* گیان لە سەر دەس نان؛ سەر لە پێناو نان؛ ئامادە بوون بۆ مردن و خۆ بەخت کردن.
**جان دادن:** گیان‌دان؛ گیان داین؛ هەڵپڵۆسکان؛ هەڵپڵۆسکیان؛ گان‌دایش؛ مردن ‹بچەی بیچارە در بیمارستان جان داد: مندالی بەستەزمان نەخۆشخانەدا گیانی دا›.
**جان داشتن:** گیان تێدا بوون؛ زیندوو بوون؛ زینگ بوون؛ گیان چنە بیەی ‹وقتی رسیدیم هنوز جان داشت: کاتێ گەیشتین هێشتا گیانی تیدا بوو›.
**جان سپردن:** گیان دانە دەستەوە ‹کمی بعد جان سپرد: پاش هێندێک گیانی دا دەستەوە›.
**جان سگ داشتن:** *[تعریض]* گیان سەخت بوون؛ سەگمەرگ بوون ‹این سوسکها جان سگ دارند و هیچ سمی بهشان کارگر نیست: ئەم قۆلانچانە گیان سەختن و هیچ دەوایەک کاریان لێ ناکا›.
**جان فدا کردن:** گیان بەخت کردن؛ گیان فیدا کردن؛ بە بۆنەی کەسێ یان شتێکەوە لە ژیانی خۆ بووران ‹جانشان را در راه میهن و ملت فدا کردند: لە پێناوی خاک و خەڵکدا گیانیان بەخت کرد›.
**جان کسی برای کسی در رفتن:** *[مجازی]* گیان کەسێک بۆ کەسێ دەرچوون؛ کەسێ زۆر خۆش ویستن و ئامادە بوون بۆ خۆ فیدا کردنی ‹جانش برای پسرش در می‌رفت: گیانی بۆ کورەکەی دەردەچوو›.
**جان کسی درآمدن:** *[مجازی]* گیانی کەسێک دەرچوون؛ مردن ‹دماغش را بگیری جانش در می‌آید: لووتی بگری گیانی دەردەچێ›.
**جان کسی را به لب رساندن:** *[مجازی]* کەسێک گیانەسەرکردن؛ گیانی کەسێک هێنانە نووک لووتی؛ ژیان لە کەسێ ناخۆش کردن ‹تا خانە را خالی کرد جانم را به لب رساند: تا ماڵەکەی چۆڵ کرد گیانەسەرمی کرد›.
**جان کسی را خریدن:** *[مجازی]* گیانی کەسێ کڕینەوە/ سەندنەوە؛ کەسێ لە مەرگ و لە ناو چوون ڕزگارکردن ‹آن روز با این کارش جان ما را خرید وگرنه همه تو دره بودیم: ئەو ڕۆژە بەو کارەی گیانی هەموومانی کڕییەوە ئەگینا گشت کەوتبووینە نێو دۆڵەکەوە›.
**جان کسی را گرفتن:** گیانی کەسێ کێشان/ گرتن؛ گیانوو یۆی کێشتەی؛ کەسێ کوشتن ‹گفت: آمدەام جانت را بگیرم: گوتی: هاتووم گیانت بکێشم›.
**جان کندن:** ۱. لە گیانەلادا بوون؛ گیان‌کەنشت کردن؛ گیان کەندن ‹وقتی رسیدیم داشت جان می‌کند: کە گەیشتین لە گیانەلادا بوو› ۲. *[مجازی]* گیان‌کێشان؛ گیان‌کەنین؛ لە زەحمەت و سەختی و ڕەنجدا بوون ‹این کە زندگی نیست، جان کندن است: ئەمە خۆ ژیان نیە، گیان کێشانە›.
**جان گذاشتن:** *[مجازی]* گیان دانان؛ ژیان بۆ کارێ تەرخان‌کردن ‹ما سر این خانه جان گذاشتیم تا درست شد: ئێمە لە سەر ئەم خانووە گیانمان داناوە تا دروست بووە›.
**جان گرفتن:** *[مجازی]* گیان تێ‌هاتنەوە؛ گیان گرتنەوە؛ گیان تێ‌کەفتنەوە؛ بووژانەوە؛ ژووژانەوە؛ ژووژ بیەیوە؛ ئامایوە وێرە؛ چاک بوونەوە و هێز گرتنەوە ‹غذایی خورد و استراحتی کرد تا جان گرفت و توانست بلند شود: شتێکی خوارد و وچانێکی‌دا تا گیانی تێ‌هاتەوە و توانی هەستێ›.
**جان مفت دربردن:** لە کلک گەڕانەوە؛ کفن دڕاندن؛ بە هەڵکەوت لە مەرگ دەرباز بوون ‹آزاد در آن حادثە جان مفت دربرد: ئازاد لەو کارەساتەدا لە کلکی گەڕاوە›.
**از جان خود مایه گذاشتن:** *[گفتاری]* بە سەر و ماڵەوە تێوە چوون/ گلان؛ لە خۆ مایە دانان؛

به گیان و دڵ کارکردن؛ بە واز و هـازی خـۆ کـارێکـردن ‹بـرای کارخانـه از جـان خـود مایـه گذاشت: بۆ کارخانـەکـە بـە سـەر و مالـەوە تێـوە چوو›.

**از جان سیر شدن** ☜ **به جان آمدن**

**از جان گذشتن:** *[مجازی]* ۱. گیانبازی کـردن؛ دەس لـە گیـان شـۆردن ‹جوانـان دلیـر از جـان گذشـتند: لاوانی ئـازا گیانبازیـان کـرد› ۲. گیـان بەخت‌کردن؛ جه وێ ویەردەی؛ بۆ ئامانجێـک ئامادەی مردن بوون.

**با جان خود بازی کردن:** *[مجازی]* ڕۆحـی خـۆ له قەرەچیان کرین؛ گیان له سـەگان دزیـن؛ کـاری بـڤەکردن؛ گیـانی خـۆ خـستنه مەترسیەوە.

**به جان آمدن:** *[مجازی]* له گیـان بێـزار بـوون؛ گیانەسەر بوون: **از جان سیر شدن**

**به جان کسی افتادن:** *[مجازی]* سـەر کردنـه کەوڵ/ کاوڵ کەسـێکەوە؛ سـەخت ئـازاردانی کەسێک ‹همه افتادند به جان من که چرا گذاشتی برود: گشتیان سەریان کردە کەوڵمەوە کە بـۆچی هێـشتت بـڕوات›. هـەروەها: **بـه جـان کـسی انداختن**

**به جان کسی بسته بـودن:** کوولەکـەی ڕۆحـی کەسـێک بـوون؛ گیـان و ڕۆحـی کەسـێ بـه شتێکەوە بەسران؛ یەکجار له لا خۆشەویـست بوون ‹پول به جانش بسته است: گیان و ڕۆحی به پارەوە بەسراوە›.

**جان**[۲]**:** *صوت.* گیان: ۱. هـا گیـان؛ بەڵـێ گیـان؛ وشەی وەلام دانەوە بـە نیـشانەی خۆشەویـستی دەربـڕین لـە ئاسـت کەسـێ هاوتەمـەن یـان چکۆلەتر له خـۆوە ‹گفـتم: آزاد!، گفـت: جـان!: وتم: ئـازاد!، وتی: گیـان!› ۲. نیـشانەی شـادی و ڕەزامەندی ‹جان! چه هوایی: گیان! چ هەوایەک›.

**ـــجان**[۳]**:** پیواژە. ـــگیـان؛ ئـازیز؛ خۆشەویـست؛ وەشـــەویس؛ دەلال ‹پـــدرجان!، خواهرجـــان!: باوکەگیان!؛ خوشکەگیان!›.

**جان‌آفرین** / cānāfarîn, -'āfarîn/: *صفت. [ادبی]* گیان‌بەخش؛ ئافرێنەری ژینەوەران.

**جانان** / cānān/: *صفت. [ادبی]* ۱. گیـانی گیـان؛ لەبەردلان؛ واشتا؛ خۆشەویـست؛ خوەشـەویس؛ وەشـەویس؛ وەشەسـیاو؛ ئـازیز وەکـوو گیـان ۲. *[تصوف]* بینایی چاوان؛ خودا.

**جانانه** / cānāne/: *صفت.* ۱. ڕێـک‌وپێـک؛ لەبـەر دڵان؛ لەبار و لەباو؛ بـێ کـەم و کـووڕی ‹رقـص جانانـه: هەڵـپەڕکێی ڕێـک‌وپێـک› ۲. *[مجـازی]* حیسابی؛ بەهێز؛ جانانـە؛ تونـد؛ بـەگوڕ؛ بـەتین ‹سیلی جانانه: زللەی حیسابی›.

**جاناً‌ومالاً** / cānan-o-mālan/: (!)[فارسـی/ عربـی] *قید.* به سەر و ماڵەوە؛ به گیان و ماڵەوە؛ به دڵ و گیان؛ به گیان و دڵ ‹همه جاناً و مـالاً بـه ایـن کـار کمک می‌کنند: هەموو به سەر و ماڵەوە ئاریکاری ئـەم کارە دەکەن›.

**جانـب** / cāneb ، ـهـا؛ جوانـب/: [عربـی]/*اسـم.* لا؛ لایەن؛ ڕەخ؛ ئالی؛ سۆ؛ تەنـشت؛ پـاڵ؛ نکـال ‹در جانـب راسـت تـصویر قـرار دارد: لـه لای ڕاسـتی وێنەکەدایە›.

⊡ **جانب کـسی را گـرفتن:** *[کنایی]* لای کەسـێ گرتن؛ لایەنگری کەسێک‌کردن؛ پشتگیری له کەسێک‌کردن ‹مادرم همیشه جانب او را می‌گرفت: دایکم هەمیشه لای ئەوی دەگرت›.

**جانبـاز** / cānbāz ، ـهـا؛ ـان/: *اسـم.* گیانبـاز؛ گیانبەخش؛ گیان‌بەختکەر؛ کەسێ که له ڕێگای سەربەرزی وڵاتەکەیدا کەم‌ئەنـدام بـووە ‹دوسـتم جانباز است و از ویلچـر اسـتفاده مـی‌کنـد: دۆستەکەم گیانبازە و به چەرخ دەڕوا›.

**جانبـازی** / cānbāzî ، ـهـا/: *اسـم.* گیانبـازی؛ گیانبەخشی؛ فیداکاری؛ گۆڕی‌کـاری؛ کـار یـان ڕەوتی ژیـانی خـۆ خـستنه مەترسـیەوە، بـه مەبەستی گەیشتن به ئامانجێک ‹جانبازی در راه میهن: گیانبازی له ڕێگەی وڵاتدا›.

**جانبخش** / cānbaxš/: *صفت. [ادبی]* ۱. ژینەر؛ بژێن؛ گیانپرژێن؛ هۆی وەدیهاتن یان گەڕیانی ژیان ‹خورشید جانبخش: ڕۆژیاری ژینەر› ۲. *[کنایی]* دڵبزوێن؛ زۆر خۆش ‹نسیم جانبخش: شنەی دڵبزوێن› * **جانپرور**

**جانبدارانه**[1] / cānebdārāne/: [عربی/ فارسی] صفت. لایەنگرانە؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی سەرچاوەگرتوو لە لایەنگرییەوە ‹داوری جانبدارانە: دادوەری لایەنگرانە›.

**جانبدارانه**[2]: *قید.* لایەنگرانە؛ بە لایەنگرییەوە؛ بە پشتگیری و لایەنگری لە لایەنێکەوە ‹جانبدارانە قضاوت نکن: لایەنگرانە داوەری مەکە›.

**جانبداری** / cānebdārî ، ـها: [عربی/ فارسی] *اسم.* لایەنگری؛ لاکۆشکی؛ پشتیوانی؛ پشتگیری ‹داور از تیم حریف جانبداری کرد: داوەر لە تیمی بەرانبەر پشتیوانی کرد›: **جانب‌گیری**

**جان‌بر کف** / cānbarkaf ، ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت. [مجازی]* گیان لەمست؛ گیان‌فیدا؛ ئامادە بۆ مەرگ یان گیان‌فیدایی ‹پیشمرگان جان‌برکف: پێشمەرگەگەلی گیان لە مست›.

**جانب گیری** / cānebgîrî/: [عربی/ فارسی] ☜ **جانبداری**

**جان‌بەسر** / cānbesar/: *صفت. [مجازی]* پەشێو؛ پەرێشان؛ نیگەران.

▣ **جان‌بەسر شدن**: *[مجازی]* گیانەسەر بوون؛ پەشێوان؛ دڵپەرێشان بوون ‹تا برگشتی جان‌بەسر شدم: تا گەڕایتەوە گیانەسەر بووم›.

هەروەها: **جان‌بەسر کردن**

**جانبی** / cānebî/: [عربی] *صفت.* ۱. تەنیشتی؛ لایی؛ پاڵی؛ پاڵین ‹در جانبی؛ پلکان جانبی: دەرگای تەنیشتی؛ پلیکانی پاڵی› ۲. لاتەکی؛ لەقی ‹فعالیتهای جانبی: چالاکی لاتەکی›.

**جان‌پاس** / cānpās ، ـها؛ ـان/: *اسم.* گیان پارێز؛ بادی‌گارد.

**جان‌پرور** / cānparvar/ ☜ **جان‌بخش**

**جان‌پناه** / cānpanāh ، ـها/: *اسم.* ۱. پەناگا؛ پەناهگەهـ؛ قوتکە یان دیوارئاسایەک بۆ خۆ حەشاردان ۲. پەرچین؛ پەرژین؛ نەردە؛ دیوار یان نەردەیەک کە بەر کەوتنە خوارەوە دەگرێ.

**جانجانی** / cāncānî/: *صفت. [گفتاری]* گیانی‌گیانی؛ جووتەی سەران؛ زۆر خۆشەویست ‹دوست جانجانی: دۆستی گیانی-گیانی›.

**جاندار** / cāndār/: *صفت.* ۱. /ـها؛ ـان/ گیاندار؛ گیانەوەر؛ گیانلەبەر؛ ژینەوەر؛ زیندەوەر؛ جاندبەر؛ جوودار؛ خاوەن‌ژی؛ جووقەوار؛ گۆنی؛ بە تایبەتمەندی زایین، خواردن، گەشە و زاوزێ‌کردن و مردن. بەرانبەر: **بی‌جان** ۲. *[گفتاری]* زەلام؛ پڕزوو؛ کەڵەگەت؛ بلەرمان.

**جان‌سخت** / cānsaxt ، ـها/: *صفت. [مجازی]* گیان‌سەخت: ۱. بە هێز و وزەی خۆڕاگری لە بەرامبەر دژواری و ڕووداوی جێ مەترسییەوە ‹مثل سگ جان‌سخت است: وەکوو سەگ گیان‌سەختە›: **سخت‌جان** ۲. سەگمەرگ؛ پتەو؛ ئەستەم؛ بە تاوشتی زۆرەوە ‹این ماشین خیلی جان‌سخت است: ئەم ماشینە زۆر سەگمەرگە›.

**جان‌سختی** / cānsaxtî ، ـها/: *اسم. [مجازی]* گیان‌سەختی؛ دۆخ یان چۆنیەتی گیان سەخت بوون: **سخت‌جانی**

**جانسوز** / cānsûz/: *صفت. [مجازی]* گیان تەزێن؛ ڕۆح‌تەزێن؛ هۆی ئازاری هزری و داخ و پەژارەی بە تەوژم ‹درد جانسوز: ئێشی گیان‌تەزێن›.

**جانشین** / cānešîn ، ـها/: *اسم.* جێگر؛ یاگەگیر: ۱. ئەوەی بتوانێ جێگەی دیتری لە کارێکی تایبەتدا بگرێتەوە ‹از آن روز بخاری گازی جانشین کرسی شد: لەو ڕۆژەوە کوورەی گازی بوو بە جێگری قورسی› ۲. /ـان/ یاگەدار؛ جێگەدار؛ جادار؛ جێنشین؛ جێگەنشین؛ جێگار؛ کەسێ کە دوای کەسێکی تر یان لە نەبوونی ئەودا جێگای بگرێتەوە و بەرپرسی کارەکان بێ ‹جانشین

فرمانده: جێگری سەرپەل› ٣. [دستور] ☜ **همنشین ـ٣**

▣ **جانشین شدن:** جێگر بوون؛ جێنشینی کەسێ بوون و کار و باری جێبەجێ کردن. هەروەها: **جانشین کردن**

**جانشینی** / cānešînî/: اسم. جێگری؛ جێ‌نشینی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی جێ‌نشین بوون ٢. کار یان ڕەوتی جێی کەسێ یان شتێ گرتنەوە.

**جانفرسا** / cānfarsā/: صفت. [ادبی] دڵ پەرتێن؛ دڵ تەمرێن؛ هۆی ئازاری هزری و داخ و پەژارەی بەتەوژم ‹کار جانفرسا: کاری گیان‌تەزێن›: **جانکاه**

**جانفزا** / cānfazā/: صفت. [ادبی] دڵ‌گەشێن؛ ڕۆح‌بەخش؛ شادی‌هێن؛ هۆی شادی و کۆک بوون ‹بهار جانفزا آمد: بەهاری دڵ‌گەشێن هات›.

**جان‌فشانی** / cānfešānî ، ـها/: اسم. گیانبازی؛ لە خۆ بوێری؛ پەل‌وپۆی چڕ و پڕ وێڕای فیداکاری؛ کار و ڕەوتی گیان‌بەخت‌کردن ‹مردم در راه سربلندی میهن جان‌فشانی کردند: خەڵکی لە ڕێگەی سەربەرزی ولاتەکەیاندا گیانیان بەخت کرد›.

**جانکاه** / cānkāh/ ☜ **جانفرسا**

**جانگداز** / cāngodāz/: صفت. [ادبی] دڵتەزێن؛ زۆر ئازاردەر و هۆی ڕەنج و خەم و پەژارە ‹خبر جانگداز؛ حادثەی جانگداز: هەواڵی دڵتەزێن؛ کارەساتی دڵتەزێن›: **جانگزا**

**جانگرایی** / cāngerāyî/: اسم. بڕوا بەوەی کە دیاردەکانی سروشتی و هەموو شتێکی ئەم جیهانە گیانی هەیە و بە دەر لە لەش و قاپۆڕەوە دەتوانێ ببێ.

**جانگزا** / cāngazā/ ☜ **جانگداز**

**جانماز** / cānamāz ، ـها/: اسم. بەرماڵ؛ مازلۆخ؛ دوگرد؛ دوگور؛ دوگوردی؛ جانماز؛ جارماز؛ شەڤل؛ مافوورە؛ پارچەیەک کە نوێژی لە سەر دەکرێ.

▣ **جانماز آب کشیدن:** [کنایی] جانماز کێشانە ئاوا؛ مەرایی‌کردن ‹نمی‌دانم واقعاً آدم درستی است یا پیش ما جانماز آب می‌کشد: نازانم بەڕاستی مرۆڤێکی باشە یان بە لای ئێمەوە جانماز ئەکێشێتە ئاوا›.

**جانمی** / cānamî/: صوت. [گفتاری] هەی گیانەکەمی؛ گیانمی؛ گیان؛ ئافەرەم؛ بارەقەڵڵا؛ بارەکەڵا؛ وشەیەک بۆ هان دان و بزواندنی بیسەر ‹جانمی، بدوا: هەی گیانەکەمی، دەرچۆ!›.

**جانمی‌جان** / cānamîcān/: صوت. [گفتاری] ئەی گیان؛ وشەیەک بۆ دەربڕینی ڕەزامەندی و خۆشی سەبارەت بە ڕووداوێک ‹جانمی‌جان، دو روز تعطیل است: ئەی گیان، دوو ڕۆژ پشوودانە›.

**جان‌نثار** / cān.nesār ، ـان/: [فارسی/ عربی] ضمیر. [ادبی] ئەزبەنی؛ منی گیان‌فیدای ئێوە (بۆ دەربڕینی ڕێز لە کەسێ خاوەن پلەوپایە) ‹جان‌نثار آمادەی خدمتگزاری است: ئەزبەنی ئامادەی خزمەت کردنم›.

**جان‌نثاری** / cān.nešānî/: [فارسی/ عربی] اسم. گیانبازی؛ لە خۆ بوێری؛ پەل‌وپۆی چڕ و پڕ وێڕای فیداکاری؛ کار و ڕەوتی گیان بەخت کردن.

**جان‌ودل** / cān-o-del/: اسم. [مجازی] گیان‌ودڵ؛ دڵ‌وگیان؛ زێڵووڵک؛ ژیان و بەندی دڵ: **دلوجان**

▣ **از جان و دل:** بە دڵ و گیان؛ بە گیان و دڵ؛ بە دڵ و بە گیان؛ پڕ بە دڵ؛ پەڕەدڵ ‹از جان‌ودل کار می‌کند: بە دڵ و گیان کار دەکا›.

**با جان و دل:** پڕ بە دڵ؛ پەڕەدڵ؛ بە دڵ و بە گیان؛ بە سەر و ڕۆح؛ بە گیان و دڵ؛ بە زۆرترین دڵخوازی و فیداکاریەوە ‹باجان‌ودل به او خدمت کردم: پڕ بە دڵ خزمەتم کرد›.

**جانور** / cānevar, cānavar ، ـها؛ ـان/: اسم. جانەوەر؛ جانەڤەر: ١. زیندەوەر؛ گیانلەبەر؛ گیانەوەر؛ هەر کام لە گیانلەبەران ‹جانور خانگی؛ جانور وحشی: زیندەوەری دەستەمۆ؛ زیندەوەری کێوی› ٢. [کنایی] چوارپێ؛ چوارپا ٣. [مجازی]

قۆشمــه؛ جــووتقۆشــه؛ هووهــات؛ نامــەت؛ نەهامــەت؛ مــرۆی نــەگونجاو یــان ســتەمکار و زۆربێژ ٤. [مجازی] کرمی ناو سـک ‹دکتـر بـرایش دوای جـانور نوشـت: بژیـشک دەوای جانـەوەری بـۆ نووسـی› ٥. [گفتـاری] مێـروو؛ جـڕ و جانـەوەر؛ بەتایبەت مێرووی ئازاردەر (وەکـوو سـپێ، گەنـە، سـوورکە و دووپـشک) ‹محوطـەی زنـدان را جـانور برداشته: ناو زیندانەکە لە جانەوەر جمەی دێ›.

▣ **جانور آزمایشگاهی**: زیندەوەری تاقیگە؛ هـەر یەکـە لـەو گیانلەبەرانـەی کـە ئازمایـشتی زانـستیان لـە سـەر دەکـرێ (وەکـوو خـووی هێندی و مشک و...).

**جانور اهلی**: جانـەوەری کـەوی؛ گیانلەبـەری ماڵی؛ جانـەوەری لـینی؛ جانەڤـەری لینـگ؛ جانەڤـــەری دەســـی؛ هـــەر یـــەک لـــەو زیندەوەرانـەی کـە بـە ژیـانی لای مرۆڤـەوە خوویان گرتووە. بەرانبەر: **جانور وحشی**

**جـانور دسـتآمـوز**: جانـەوەری دەسـتەمۆ؛ گیانلەبەری دەسەمۆ؛ زیندەوەرێ کە مرۆڤ بۆ جێبەجێ کردنی کارگەلێ دیاریکراو ڕایهێناوە.

**جانور وحشی**: دڕندە؛ ڕاوڕ؛ جانەوەری کێـوی؛ هـەر کـام لـەو زیندەوەرانـەی کـە دوور لـە ژینگەی مرۆڤەوە دەژین و کەوی نەبوونەتەوە. بەرانبەر: **جانور اهلی**

**جـــانوران** / cānevarān, cānavarān/: اسـم. گیانلەبەران؛ یەکێ لە سێ زنجـیرەی سـەرەکی بوونەوەران.

**جانورخو** / -cānevarxû, cānavar ، ـیان/: صفت. [کنایی، ادبی] دڕندەخوو؛ تووش؛ تیژۆ.

**جانورشناس**/ -cānevaršenās,cānavar ، ـها؛ـان/: اسم. جانەوەرناس؛ زیندەوەرناس؛ گیانـەوەرناس؛ پسپۆڕی زیندەوەر ناسی

**جانورشناسی**/ -cānevaršenāsî, cānavar/: اسم. گیانەوەرناسـی؛ زانـستێ کـە لەمـەڕ ژیـانی گیانەوەران دەکۆڵێتەوە.

**جانی** / cānî/: صفت. ١. گیانی؛ پێوەندیدار یـان سەر بە گیانەوە ‹آسیب جانی: خەسـاری گیـانی› ٢. گیـانی؛ زۆر خۆشەویـست ‹یـار جـانی: یـاری گیـانی› ٣. /ـهـا؛ ـان/ پیـاوکوژ؛ جەنایـەتکار؛ تاوانباری گەورە ‹انسان جانی: مرۆڤی پیاوکوژ›.

**جاودان** / cāv(e)dān/ ☜ **جاویدان**

**جـــاودانگی** / cāv(e)dānegî/: اسـم. [ادبـی] تاهەتایی؛ هەتاهـەتایی؛ هـەرمانی؛ هەرمەنـەی؛ هەمیـــشەیی؛ نـــەمری؛ نەمـــەردەنی؛ دۆخ یـــان چۆنیەتی هەرمان بـوون ‹جـاودانگی جـز خـدای را نشاید: تاهەتایی هەر بۆ خودا دەشێ و بەس›.

**جاودانـه**[1] / cāv(e)dāne ، ـهـا/: صفت. [ادبـی] تاهـەتایی؛ هەتاهــەتایی؛ هەمیــشەیی؛ هــەرماو؛ هەرهە؛ بێبڕانەوە؛ بۆ هەمیشە یـان بـە شـێوەی هەمیشەیی ‹افتخار جاودانه: شانازی تاهەتایی›.

**جاودانـه**[2]: قیـد. [ادبـی] تاهــەتا؛ هەمیــشە؛ هەمیشەودەرە ‹جهان جاودانه نمانـد بـه کـس: دنیـا تاهەتا بۆ کەس نامێنێ›.

**جاودانی** / cāv(e)dānî/: صفت. [ادبی] تاهەتایی؛ هەتاهەتایی؛ هەمیشەودەرە؛ هەمیشەیی؛ نەمری ‹که زندگانی کس نیز جاودانی نیست: تاهەتایی ژیان بە کەس نابێ›.

**جاویـد**[1] / cāvîd/: صـفت. [ادبـی] تاهــەتایی؛ هەتاهــەتایی؛ هــەتایی؛ هەمیــشەیی؛ هەرهــە؛ هەرماو؛ هەربووگ؛ نەمر؛ خاوەن تەمەن هەڵکرد یان مانەوە ‹سرزمین جاوید؛ نـام جاویـد: نیـشتمانی هەمیشەیی؛ ناوی نەمر›. هەروەها: **جاویـد بـودن؛ جاوید شدن**

**جاوید**[2]: قید. [ادبـی] (بـۆ) تاهــەتا؛ هەتاهــەتا؛ بـۆ هەمیشە ‹آنچه جاویـد بمانـد نـام اسـت: ئـەوەی کـە تاهەتا دەمێنێ ناوە›.

**جاویدان**[1] / cāvîdān/: صفت. [ادبـی] تاهـەتایی؛ هەتاهــەتایی؛ هەرهــە؛ هەمیــشەیی؛ هــەرماو؛ بێبڕانەوە؛ بێوێنە و نەهوو ‹نام تو زندەی جاویـدان است: ناوی تۆ زیندووی تاهەتاییە›: **جاودان**

**جاویدان**[2]: *قید*. هەتاهەتایی؛ هەمیشەیی؛ بۆ هەمیشە ‹نام و یادشان جاویدان باد: ناو و یادیان هەتاهەتایی بێ›: **جاودان**

**جاه** / cāh/: [معرب از فارسی باستان]/*اسم*. شکۆ؛ گەورەیی؛ پایەبەرزی؛ شان؛ مەزناهی؛ ئەوەی دەبێتە هۆی سەربەرزی و شانازی.

**جاه‌طلب** / cāhtalab ، ـها؛ ـان/: [معرب/ عربی] *صفت*. سەرخواز؛ خوازیاری گەیشتن بەپلەوپایە و ناوبانگ. هەروەها: **جاه‌طلبی**

**جاهک** / cāhak/: *اسم*. چەڵەمە؛ چۆڵەمە؛ ئێسکی سەر سنگ.

**جاهل**[1] / cāhel ، ـها/: [عربی]/*اسم*. لات؛ لاوی نەخوێندەوار یان ڕەشخوێنی بنەماڵەی هەژاری شار کە کارێکی وای نیە و بە بۆنەی زۆرداری و نەترسی و ئاکاری نەشیاوەوە بەرچاوە ‹جاهل محله: لاتی گەڕەک›.

**جاهل**[2] ـان؛ جُهّال/: [عربی] *صفت*. ١. *[ادبی]* نەزان؛ تێنەگەیشتوو؛ دوورەزانست ‹مرد جاهل: پیاوی نەزان› ٢. *[مجازی]* جاهێڵ؛ جەحێڵ؛ جێڵ؛ هەرزەکار؛ لاو؛ گەنج؛ جوان ‹جوان است، جاهل است، برود کار کند: جوان و جاهێڵە، بچێ کار بکا›.

**جاهلانه**[1] / cāhelāne/: [عربی/ فارسی] *صفت*. نەزانانە؛ گەوجانە؛ وەکوو خەڵکی تێنەگەیشتوو ‹فکر جاهلانه: بیری نەزانانە›.

**جاهلانه**[2]: *قید*. نەزانانە؛ بەنەزانی؛ گەوجانە؛ تێنەگەیشتوانە ‹این طور جاهلانه رفتار نکن: ئاوا نەزانانە مەجووڵەوە›.

**جاهلیت** / cāhelîyyat/: [عربی]/*اسم*. نەزانی؛ نەفامی؛ دواکەوتوویی؛ گەوجی ‹تعصب نشانه‌ی جاهلیت است: ڕکە نیشانەی نەزانیە›.

**جای** / cāy ، ـها/: *اسم*. *[ادبی]* جێ؛ جێگە؛ جا؛ جاگە؛ جهـ ؛ گولە؛ یاگە؛ حان؛ حەن؛ کەی؛ سەرا؛ هەروون؛ هەروونە؛ هەروند؛ ئاقار؛ شوێن؛ یاتاخ؛ سۆر؛ ناخ؛ گەهـ.

**جایز** / cāyez/: [عربی] *صفت*. شیاو؛ درووس؛ هلێو؛ ڕەوا؛ دەرخۆر.

▣ **جایز شمردن/ دانستن**: بە ڕەوا زانین؛ بە درووس زانین ‹خوردن روزه را برای شخص بیمار جایز شمرده‌اند: ڕۆژوو شکاندنیان بۆ نەخۆش بە ڕەوا زانیوە›.

**جایزالخطا** / cāyezolxatā/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* جێ خەتا؛ خەتاگەر؛ بە ئەگەری هەڵەکردن.

**جایزه** / cāyeze ، ـها؛ جوایز/: [عربی]/*اسم*. خەڵات: ١. دەستخۆشانە؛ دەس‌خوەشانە؛ پاداشێ کە بە سەرکەوتووی کێبەرکێیەک دەدرێت ‹جایزه‌ی اسب‌دوانی: خەڵاتی شەڕانخێوی› ٢. پاداشێ کە بە بۆنەی ئەنجامدانی کارێکی شیاوەوە بە کەسێ دەدرێت ‹جایزه‌ی خوش‌حسابی: خەڵاتی خۆش‌حیسابی› ٣. ئەوەی لە پشک خستندا وەبەر کەسێ دەکەوێ ‹جایزه‌ی بخت‌آزمایی: خەڵاتی بەخت ئەزموونی›.

▣ **جایزه بردن**: خەڵات بردنەوە؛ بە دەس هێنانی پاداشت. هەروەها: **جایزه دادن؛ جایزه گرفتن**

**جایزه‌بگیر** / cāyzebegîr ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. ئەوی کاری گرتن و دانە دەسەوەی کەسانێکە کە بۆ گرتنیان خەڵاتیان داناوە.

**جایگاه** / cāygāh ، ـها/: *اسم*. جێگا؛ جێگە؛ جێیە؛ جیە؛ جاگە؛ یاگێ؛ یاگە: ١. جێی دیاریکراو بۆ کەسێ یان شتێک ‹جایگاه تماشاچیان؛ جایگاه فروش بنزین: جێگەی تواشاچیان؛ جێگای فرۆتنی بەنزین› ٢. پێگە؛ پلە و پایە ‹لازم است جایگاه هر یک از کارکنان انجمن مشخص شود: پێویستە جێگای هەر کام لە کاربەدەستانی ئەنجوومەن دیاری بکرێت›.

**جایگزین** / cāygozîn ، ـها/: *اسم*. جێگرەوە؛ لەجێ؛ جێگەگر؛ یاگەوەگیر؛ ئەوەی لە جێگەی کەسێ یان شتێکی‌تر بێ و لە باری کارامەیی و چۆنیەتیەوە ـ کەم تا زۆر ـ وەکوو یەک بن ‹بعد از مرگ ناصر، در مصر اسلحه‌ی آمریکایی جایگزین

اسلحه‌ی روسی شد: پاش مەرگی ناسر، لە میسردا چەکی ئەمەریکایی بوو بە جێگرەوەی چەکی ڕووسی›.

◘ **جایگزین شدن:** لە جێ دانران؛ جێگرەوە بوون؛ بە جێی دیتران دانران یان کار کردن.

**جایگزین کردن:** لە جێ دانان؛ بە جێی شتێ یان کەسێتر دانان یان بە کار بردن ‹موتورهای گازسوز را جایگزین موتورهای گازوئیلی کردیم: موتۆری گازیمان لە جێی موتۆری گازوئیلی دانا›.

**جایگزینی** / cāygozînî/: اسم. جێگرتوویی؛ جێگرەوەیی؛ یاگەوەگیری؛ جێگری: ١. بار و دۆخ یان چۆنیەتی جێگرتوو بوون ‹جایگزینی گاز به جای نفت: جێگرتوویی گاز لە جێی نەوت› ٢. کار یان ڕەوتی لە جێ دانان ‹جایگزینی ماشینهای داخلی: جێگرەوەیی ماشینگەلی ناوخۆیی›.

**جایگیر** / cāygîr/ ☜ **جاگیر**

**جایگیری** / cāygîrî/: اسم. ١. جێگیری؛ جێگری؛ جاگری؛ سەقامگیری؛ کار یان ڕەوتی نیشتەجێ بوون یان دامەزران لە شوێنێکدا ٢. *[گیاه‌شناسی]* ڕەوتی ڕسکان؛ ڕوان؛ شین بوون و هەڵدانی ڕوەک لە شوێنێکدا.

**جاین** / cāyn/: [؟] اسم. جاین؛ دینێکی هێندی کە (لە سەدەی ٦ی پێش زایین) لە لایەن مەهاویراوە هاتە گۆڕێ و لە سەر بنەمای ئازار نەدانی گیانەوەران و پالاوتنی ڕۆح دامەزراوە.

**جایی** / cāyî/: اسم. *[گفتاری]* دەس‌ئاو؛ دەس بە ئاو؛ کناراو؛ مەستەراو؛ مستەراو؛ سەرحەوز.

**جبار**[1] / cabbār/: [عربی] ☜ **شکارچی-٢**

**جبار**[2] / ـان/: [عربی] صفت. ملهوڕ؛ زۆروێژ؛ ستەمکار؛ زاڵم؛ بێ‌ڕەحم؛ سەرکێش ‹حکومت جبار: حکوومەتی ملهوڕ›.

**جبال** / cebāl/: [عربی] جمعِ ☜ **جَبَل**

**جبان** / cabān/: [عربی] صفت. *[ادبی]* ترسەنۆک؛ ترسەتووک؛ تەرسەزاڵ؛ ترسەزاوەر؛ کەمزات؛ کەلەزات؛ بێ‌زات؛ کەمدڵ: **جبون**

**جبر** / cabr/: [عربی] اسم. ١. لقێکی گەورەی زانستی بیرکاری ٢. زەبر؛ زۆر؛ گوڕ و زۆر بۆ ناچارکردنی کەسێ بە کارێک ‹جبر روزگار: زەبری ڕۆژگار› ٣. خورتی؛ جەبر؛ ئامۆژەیێ کە شوێنکەوتوانی، مرۆڤ بە ناچار لەو کارانەی کە دەیکا دەزانن و کارەکانی سەرچاوەگرتوو لە خواستی خوا دەبینن. بەرانبەر: **تفویض**

**جبراً** / cabran/: [عربی] قید. ١. زۆراتی؛ بە زۆرەملێ؛ بەزەبری زۆر؛ بە زۆر(ی)؛ بە خۆرتی؛ بەجەبری ٢. ناچار؛ بە ناچار؛ ناعیلاج ‹جبراً به آن کار تن دادم: ناچار ملم بەو کارە دا›.

**جبران** / cobrān/: [عربی] اسم. قەرەبوو؛ بارە؛ باربوو؛ ئفت؛ کار یان ڕەوتی کردنەوەجێ؛ بەرگری‌کردن لە ڕووداوی زیانبار یان جوولانەوە بە مەبەستی لە نێو بردن یا کەم کردنەوەی زیانی ڕووداو ‹جبران عقب‌ماندگی درسی: قەرەبووی دواکەوتوویی وانەیی›. هەروەها: **جبران شدن؛ جبران کردن**

**جبرانی** / cobrānî/: [عربی] صفت. قەرەبوویی؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی باربووکردنەوە ‹خسارت جبرانی: زیانی قەرەبوویی›.

**جبرگرایی** / cabrgerāyî/: [عربی/ فارسی] اسم. خۆرتیوازی؛ بیرۆکە یان ئامۆژەیێ کە هەموو جۆرە کردەوەیەکی ویستی، ڕووداوی سروشتی، دیاردەی کۆمەڵایەتی یان ڕەوانی، سەرچاوکە گرتوو لە ڕووداوگەلی پێشوو یان قانوونگەلی سروشتی دەزانێ و بەو پێیە هەڵیاندەسەنگێنێ: **اصل ضرورت علّی؛ اصل موجبیّت**. هەروەها: **جبرگرا**

**جبروت** / cabarût/: [عربی] اسم. *[ادبی]* شکۆ؛ گەورەیی؛ هێز و چیری هاوڕێ لەگەڵ سەربەرزی ‹جلال و جبروت: گەورەیی و شکۆ›.

**جبرومقابله** / cabr-o-moqābele/: [عربی] اسم. جەبر؛ ناوی کۆنی زانستی جەبر.

**جبری** / cabrî/: [عربی] *صفت.* ١. جەبری؛ پێوەندیدار بە زانستی جەبرەوە ٢. بڕوامەند بە جەبر ☜ **جبر-٣** ٣. بەزۆری؛ زۆرەکی؛ زۆرەملێ؛ ناچاری ‹اطاعت جبری: ملدانی بەزۆری›.

**جبل** / cabal ، جبال/: [عربی] *اسم. [ادبی]* کێو؛ کەژ؛ کێف؛ کۆ؛ کەش؛ چیا؛ شاخ؛ کوویە ‹جبل طارق: کێوی تارق›.

**جبلی** / cebellî/: [عربی] *صفت. [ادبی]* سروشتی؛ خۆڕسکی؛ زگماکی؛ زاتی؛ پێوەندیدار بە سروشت یان خۆ و خدەوە ‹دروغگویی عادت جبلی او بود: درۆ کردن خووی سروشتی ئەو بوو›.

**جبن** / cobn/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ترسەنۆکی؛ ترسنۆکی؛ ترسەزاوەری؛ تەرسەزاڵی؛ نەوێری؛ کەمزاتی؛ کەلەزاتی؛ کەمدڵی.

**جبون** / cabûn/: [از عربی] ☜ **جَبان**

**جبه** / cobbe/: [عربی] *اسم.* ١. *لـ‌ها/[قدیمی]* جبە؛ جببە؛ خەرقە؛ بالاپۆش؛ کەوا؛ جلێکی درێژ و قۆڵدار و بێ ملیوان کە پیاوان بە سەر جل و بەرگی تردا لەبەریان دەکرد ٢. *[زمین‌شناسی]* پاژی ژێر توێکڵی زەوی (تا قووڵایی ٢٩٠٠ کیلۆمیتر).

**جبهات** / cabahāt/: [عربی] جمعِ ☜ **جبهه**

**جبه‌خانه** / cabbexāne ، ـها/: [ترکی؟/ فارسی] *اسم. [نظامی]* قۆرخانە؛ جبەخانە؛ جەبەڵخانە؛ کارخانەی دروست کردنی چەک و کەرستەی شەڕ بە گشتی.

**جبهه** / cebhe, cabhe ، ـها؛ جَبَهات/: [عربی] *اسم.* ١. شەڕگە؛ بەرگا؛ بەرەی شەڕ؛ گۆڕەپانی شەڕ؛ شوێنێ کە تێیدا دوو گرۆی دژ بە یەک لە شەڕدان ‹اعزام شدن به جبهه: ناردران بۆ شەڕگە› ٢. جێی پێکدادانی دوو کۆمەڵە هەوای سارد و گەرم ٣. بەری ساختومان؛ نمای ماڵ ٤. *[مجازی]* بەرە؛ تاقمێک کە ئەندامانی بۆ ئامانجێکی گشتی چالاکیان هەیە ‹جبهەی دوست؛ جبهەی مخالف: بەرەی دۆست؛ بەرەی نەیار› ٥. *[سیاست]* بەرە؛ یەکگرتوویی ڕێخراوە، دامەزراوە و دەستەگەلی بە بیر و دۆزی جیاوازەوە کە بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی هاوبەش یان بەرهەڵستی دژمنێکی هەمووانی، یەک دەگرنەوە، بێ ئەوەی لە مەرامی سیاسی یان دینی خۆیان دەس هەڵگرن ‹جبهەی میهنی؛ جبهەی ضد فاشیست: بەرەی نەتەوەیی؛ بەرەی دژ بە فاشیست› ٦. *[قدیمی]* ئەنی؛ هەنی؛ هەنیە؛ تەوێڵ؛ ناوچاوان.

▣ **جبهه عوض کردن:** پشت لە خۆیی کردن؛ پشتکردنەوە لە بەرەی خۆ و پاڵ بە گرۆی ترەوە دان ‹او تاکنون چند بار جبهه عوض کرده است: تا ئێستا چەن جار پشتی لە خۆیی کردووە›.

**جبهه گرفتن:** *[مجازی]* بەرهەڵستی کردن؛ هەڵوێست گرتن؛ و نەیاری کردن ‹برخی از دوستان در برابر من جبهه گرفتند: هێندێ لە هەڤالان بەرهەڵستی منیان کرد›.

**از جبهه برگشتن:** ١. لە شەڕگە هاتنەوە ٢. *[کنایی]* پرتووکاو و ڕزیاو بوون؛ شڕ و وڕ یا ورد و خاش بوون.

**به جبهه رفتن:** بۆ شەڕگە چوون.

**در چند جبهه جنگیدن:** لە چەند لاوە خەبات کردن؛ لە بەرامبەر دوژمن یان دژواریگەلی زۆرەوە ململانێ کردن ‹دولت مجبور بود در چند جبهه بجنگد: دەوڵەت ناچار بوو لە چەند لاوە خەبات بکا›.

**جبیر** / cebîr ، ـها؛ ـان/: [؟] *اسم.* جیبیر؛ جۆرێ ئاسکی کێویە، بە دوو شاخی باریکەوە.

**جبین** / cabîn ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* توێڵ؛ تێول؛ تەوێڵ؛ تەڤێل؛ ئەنی؛ هەنی؛ هەنیە؛ هانیە؛ جەمین؛ ناوچاوان.

**جت** / cet ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* جیت؛ کەرەسەیەک کە بە فیشەکردنی گاز لە بنیەوە کار دەکا.

**جثه** / cosse ، ـها/: [عربی]/اسم. هەیکـەل؛ گـۆدە؛ گۆڤدە؛ کەلەخ؛ کەلەسـتە؛ پەیکـەر؛ جەنـدەک؛ مەند؛ لەشی مرۆ ‹جثەی بزرگی داشت: هەیکـەلێکی گەورەی هەبوو›.

**جخـت**[1] / caxt/: اسـم. *[فرهنـگ‌مـردم]* جـەخت؛ دووهەمین پژمە. بەرانبەر: **صبر**: **جخد** *[گفتاری]*

**جخت**[2]: *قید. [گفتاری]* ڕێک؛ پڕ بە پڕ؛ بە تەواوی؛ تەواو ‹جخت خودش است؛ جخـت یـک بـشکه را پـر می‌کند: ڕێک خۆیە؛ پربەپر بۆشـکەیەک پـڕ دەکـا›: **جخد** *[گفتاری]*

**جخد** / caxd/ ☜ **جخت**

**جد** / cad(d) ، اجداد/: [عربی]/اسم. ١. بـاوا؛ بـاپیر؛ بـاپیرە؛ کـاڵ؛ پـشت ٢. بـاپیرە گـەورە؛ بـابی باوەگەورە؛ بابی دایە گەورە.

▣ **جـد امجـد**: باوەگـەورە؛ باواگـەورە؛ بـاپیرە گەورە؛ کاڵی بە شان و شکۆ.

**جد اندر جد**: پشتاو پشت؛ باوک پشت باوک.

**جد پدری**: باپیرەی باب؛ باوەگەورەی بـاوک؛ باپیرە لە بابەوە. هەروەها: **جد مادری**

**جد** / ced(d)/: [عربی]/اسم. ١. پەل؛ پـێ‌داگـری؛ چڕی؛ چڕوپڕی ‹جدوجهد: پەل‌وپـۆ› ٢. ڕاسی؛ بـە ڕاست؛ ڕاستی؛ بێ‌گاڵتە.

▣ **جـد کـردن**: *[گفتـاری]* پـێ‌داگـرتن؛ پـێ داچەقاندن؛ پێ‌داگری و داکۆکی‌کردن.

**جدا**[1] / codā/: *صفت.* جوێ؛ جـودا؛ جیـا؛ کـەل؛ پەسـا: ١. بـێ پێوەنـدی لەگـەڵ شـتێکی‌تـر ‹برگهایش از هم جدا بود: گەڵاکانی لێک جوێ بوون› ٢. بەجیا؛ جیاواز؛ دوور لە یەک و بە مەودایـەک لە نێوانیاندا ‹آن را جدا گذاشـته بـودم: ئـەوم بـەجیـا دانابوو› ٣. جیاواز؛ هەڵبژێراو یان وەلانـراو ‹ایـن سیبها از آنها جداست: ئەم سێوانە لەوانی‌تر جیاوازە›.

▣ **جدا شدن**: جیاوە بوون؛ جیا/ جـودا بوونـەوە؛ جـوێ بوونـەوە: ١. هەڵـوەژێران؛ ڤـەقەتان؛ ڤەقەتیان؛ ڤـەقەتین؛ لێـک پچـڕان؛ ڕاپـسان؛ گەمرین؛ لە نێو چوونی پێوەندی چـەن شـت یان چەند بەش لە شـتێک ‹جـدا شـدن میـوه از درخـت: جیـا بوونـەوەی مێـوە لـە دارەکـەی› ٢. دوایی پێـدان بـە پێوەنـدی ژن و شـوویی ‹جدا شدن زن و شوهر: جیا بوونەوەی ژن و شـوو› ٣. هەڵبڕان؛ لێـک هەڵـبڕان؛ دوورکەوتنـەوە؛ هل بوورین؛ لە یەکتر جودا بوونەوە و لـە لای یەکتر ڕۆیشتن ‹پس از پایان جلسه از یکدیگر جدا شدیم: پاش دوایی هاتنی کۆڕەکە لـە یـەکتر جیـا بووینەوە›.

**جـدا کـردن**: جیاکردنـەوە؛ جـوێ‌کردنـەوە؛ جوداکردنەوە: ١. لێک جیـاوەکـردن؛ بـڕدان؛ تاکاننەوە؛ لێگرتنەوە؛ گەمراندن؛ لە نێو بردنی پێوەندی شتێ یان شـتگەلێ لـە شـوێن یـان جێگەی پێشووی ٢. *[گفتاری] [الف)* هەڵبژاردن؛ هەڵوەژاردن؛ هەلشاندن؛ ژێ‌کـرن ‹میـوەهـای خـوب را جـدا کـرد و خـورد: مێـوە باشـەکانی جیـاکردەوە و خـواردنی› ب) ڕیزبەنـدی‌کـردن ‹نامەهای بچەها را جدا کرد و داد به دست خودشان: نامەی منداڵـەکانی جیـاکردەوە و دایـە دەسـتی خۆیانەوە›. هەروەها: **جدا بودن**؛ **جدا ماندن**

**جدا**[2] / codā/: *حرف.* جگە؛ بێجگە؛ جگـا ‹جـدا از این، باز هم هست؟: جگە لەمە، دیسان هەیە؟›.

**جـداً** / ceddan/: [عربـی] *قیـد.* بـە پـێ‌داگـری؛ پێداگرانە؛ بە مجـد؛ بـە چـڕی ‹مـا جـداً از دولـت مـی‌خـواهیم مـسئلەی بیکـاری را حـل کنـد: ئێمـە بـە پێ‌داگریەوە لە دەوڵەت داوا دەکەین گـیر و گـرفتی بێکاری چارەسەر بکا›.

**جدائی** / codā'î/ ☜ **جدایی**

**جدا‌ـجدا** / codācodā/: *قید. [گفتاری]* جیاـجیـا؛ جوێ‌ـجوێ ‹قرصها را جداـجدا بخـور، یکـی پـیش از غذا، یکی بعد از غذا: حوبەکان جیاـجیا بخۆ، یـەکیان بەر لە نان، یەکیشیان دوای نان›.

**جدار** / cedār ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. دیوارە ‹جـدار بشکه: دیوارەی بەرمیل› ٢. *[گیاه‌شناسی]* پەڕەیەکی ناسک کە دەبێتە هـۆی دابەشـینی تۆمـدان بـە

چەن خانۆکەیەکی دیاریکراوەوە ❊ جداره

▣ **جدار چاه:** دیوارەی چا.

**جدار خارجی:** دیوارەی دەرەکی.

**جدار داخلی:** دیوارەی ناوەکی.

**جداره** / cedāre/: [عربی/ فارسی] ☜ **جدار**

**جـــداری** / cedārî/: [عربـی] *صفت.* لێـوارەیی؛ دیـوارەیی؛ پێوەندیـدار و سـەر بـە لێـوار یـان دیوارەوە.

**جداسـازی** / codāsāzî، ـها/: *اسم.* جوێکـاری؛ جوداکـاری؛ جیاوەکـەری؛ کـار یـان ڕەوتی جیاکردنەوە؛ جوێ کردنـەوە؛ لێـک کردنـەوە؛ لـە یـەکتر جیـا کردنـەوە ‹جداسـازی نیـرو؛ جداسـازی زمینهـای کـشاورزی: جوێکـاری هێزەکـان؛ جیـا کردنەوەی زەوی کشتوکاڵ›.

**جداگانه**[1] / codāgāne/: *صفت.* جیاواز؛ جیاکـار؛ جیا لە یەکتر ‹هر یک اتاق جداگانه داشتند: هەر کـام ژووری جیاوازیان هەبوو›.

**جداگانه**[2]: *قید.* جیا-جیا؛ جیاواز؛ جیاکار؛ بـەجیا؛ بە جیاواز؛ بە شێوازی جیا لە یەکتر ‹زن و شـوهر هر کدام جداگانـه بـه سفر مـی‌رفتنـد: ژن و شـووەکە جیا-جیا بۆ سەفەر دەڕۆیشتن›.

**جدال** / cedāl، ـها/: [عربی] *اسم.* [ادبی] کێـشە؛ ڕوشت؛ مشتومڕ؛ خڕ و جز؛ هەرا؛ شـەڕەچەقە؛ بەربـەرەکانێ؛ گێـرە و کێـشە؛ گـەلج؛ پێکـەوە هەڵچوون ‹جدال بر سر مقام، مـانع از اتحادشـان شـد: کێـشە لـە سـەر پلـە و پایـە، ڕێ بـە یـەکگرتنیانی بەست›.

▣ **جدال لفظی:** شەڕەقسە؛ کێشە؛ دم بە دمـە؛ دەمەدەمێ ‹راه اثبات موضوع، جـدال لفظـی نیـست بلکـه اسـتدلال منطقـی اسـت: ڕێگـەی سـەلماندنی مەبەست، شەڕەقسە نیە بەڵکوو هێنانەوەی بەڵـگەی ژیرانەیە›.

**جداول** / cadāvel/: [عربی] جمعِ ☜ **جدول**

**جدایی** / codāyî، ـها/: *اسم.* ۱. جیایی؛ جودایی؛ جدایی؛ لێک جیـایی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی جیـا بـوون ‹جـدایی دیـن از سیاسـت: جیـایی دیـن لـە سیاسـەت› ۲. تـەڵاق؛ پچـڕانی پێوەنـدی ژن و شوویی ‹اختلاف سن موجب جدایی زن و شـوهر شـد: جیاوازی تەمەن بـوو بـە هـۆی جیابوونـەوەی ژن و شووەکە› ۳. *[ادبی]* جیایی؛ جودایی؛ جیاوەبوون؛ لێک هەڵبڕان؛ دۆخ یان چۆنیەتی لێک دوورەوە بوون ‹خواننده از درد جدایی می‌نالید: گۆرانیبێژەکە لە دەردی جودایی دەینالاند› ❊ **جدائی**

**جـدایی‌خـواهی** / codāyîxāhî، ـهـا/: *اسـم.* جیـایی‌خـوازی؛ جـودایی‌خـوازی؛ ویـست یـان چالاکیـەک بـۆ جیاکردنـەوەی بەشـێ لـە بەردەستایی وڵاتێک و دەرهێنـانی بـە شـێوەی دەوڵەتێکی سەربەخۆ: **تجزیه طلبی**. هـەروەها: **جدایی‌خواه**

**جـــدایی‌ناپـــذیر** / codāyînāpazîr/: *صـفت.* لێـکنەبـڕ؛ جیاونـەبووگ؛ بـە بـار و دۆخ و چۆنیەتیەک کە جودا بوونی بۆ نـەبێت ‹دوسـتان جـدایی ناپـذیر: هـەوالانی لێـکنەبـڕ›. هـەروەها: **جدانشدنی**

**جدل** / cadal/: [عربی] *اسم.* ۱. [ـها/ کێشە؛ مود؛ گلتـە؛ بنـار؛ جراجـڕ؛ شـەڕە قـسە؛ دەمەقاڵـە؛ وتوویـژی بـە ڕک و قینـەوە بـۆ سـەلماندنی قسەی خۆ ‹این همه بحث و جدل برای چیست؟: ئەم هـەموو بـاس و کێـشەیە بـۆ چیـە؟› ۲. *[منطق]* وتوویژ؛ هەڤپەیڤین؛ دوان؛ دیالکتیک.

**جدوآبا** / cadd-o-'ābā/: [عربی] *اسم.* بـاب‌وکـاڵ؛ باب و باپیران؛ ئابا و ئەژدا؛ باوک و باوا.

**جدوآباد** / cadd-o-'ābād/: [عربی] *اسم. [گفتاری]* باب و باپیران ‹همەی جدوآباد بالارودیها شکارچی بودند: هەموو باب و باپیرانـی سەرچۆمیەکان ڕاوچـی بوون›.

**جدوجهد** / cedd-o-cahd/: [عربی] *اسم.* پەل وپۆ؛ کردوکۆش؛ تەپشت؛ هـەوڵ و تـەقالا؛ کۆشـش؛ کۆششت ‹او خیلی جد و جهد کرد تا بلکـه بـه سـنندج منتقل شود: زۆری پەل‌وپۆ کرد بەڵکوو بگوێزرێتەوە بۆ

سنه›.

**جـــدول / cadval** ، ـهـا؛ جـداول/: [عربـی]/اسـم. ١. مالک؛ خشته؛ هێڵگەلی ئەستوونی و ئاسۆیی بە شێوەی ماڵ ـ ماڵی چوار گۆشە ٢. جۆلە؛ جۆگەلـە؛ قـەناو؛ دیـوارەی کـورتی بـەردین یـا سیمانی لای شەقام.

**جـدول تنـاوبی/ دورەای:** *[شـیمی]* خـشتەی مەندەلیف؛ ڕیزکـردنی توخمگـەلی کیمیـایی بەپێی کێشی ئەتومی کـە دەبێتـە هـۆی لای یەک گرتنی (ئەستوونی و ئاسۆیی) توخمگەلی بە تایبەتمەندی لێک نزیکەوە: **جدول مندلیف**

**جــدول ضـرب:** *[ریاضـی]* خـشتەی لێکـدان؛ خشتەیێ کە ئـەنجامی لێکـدرانی ژمارەکـان پیشان دەدا (وەک ٢٨=٤×٧ یان ٤٠=٥×٨).

**جـــدول فیثـــاغورس:** *[ریاضـــی]* خـــشتەی فیساغوورس.

**جدول کلمات متقاطع:** خـشتە؛ مـاڵ ـ ماڵـی چوارگۆشـە کـە لـە نێـو ماڵـەکانیدا دەبـێ پیتگەلێکی تایبەت بنووسرێت تا وشەیەک کە ویستراوە دەرکەوێ.

**جدول مندلیف** ☜ **جدول تناوبی/ دور**

**جــدول‌بنــدی / cadvalbandî** ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. خـشتەڕێژی: ١. کـار یـان ڕەوتی خانە‌ـخانە کردن؛ دابەش‌کردنی لاپەڕەیـەک بـە شێوازی خانە‌ـخانە ٢. کار و ڕەوتی سـەقا دان و تـەکووز کـردنی زلانیـاری بـە شـێوەی خـشتە ٣. خشتەسازی ٤. کێشانی خشتە.

**جدول‌سازی / cadvalsāzî** ، ـها/: [عربی/ فارسـی]/اسم. خـشتەسازی؛ دیراوسـازی؛ جۆگەلەسـازی؛ قەناوسـازی؛ کـار یـان ڕەوتی دروسـت‌کـردنی دیوارۆکە لە بەرد و سیمان بـۆ لێـواری شـەقام، پرد یان ئاوەڕێ.

**جدول‌کشی / cadvalkešî** ، ـها/: [عربی/ فارسـی]/اسم. ١. خشتەکێشی؛ ڕەسمی خـشتە لـە سـەر پـەڕەی قاقـەز ٢. جۆگەبـڕی؛ کـار یـان ڕەوتی دروست‌کردنی جۆگەلە.

**جده / cadde** ، ـهـا؛ جَـدّا*[نامتـداول]*/: [عربـی]/اسـم. داپیر؛ دایەپیرە؛ دایەگەورە؛ دایەخانم؛ نەنە؛ ماما؛ ئامـە: ١. دایکـی دایـک یـان دایکـی بـاوک ٢. دایکی دایەگەورە یان دایکی باوەگەورە.

**جدی / cady**/: [عربی] /اسم. ١. ☜ **بزغالـه ـ١** ٢. *[تقویم]* دەهەمین برج لە دوازدە برجی سـاڵ، بەرانبەری بەفرانبار.

**جـــدی / ceddî**/: [عربـی] صـفت. ١. ڕاسـت؛ ڕاستەقینە؛ بێ‌شۆخی؛ جد؛ مجد؛ دوور لە گاڵتە و گـەپ؛ بـە دۆخ یـان چۆنیـەتی ڕاسـتەقینە، گرنگ، ئامانجدار و پێویستی ورد بوونـەوە و بـە دوادا چوون. بەرانبەر: **شوخی** ‹بحث جدی است؛ جدی مـی‌گفـت: باسـەکە ڕاسـتەقینەیە؛ بـە ڕاسـتی دەگـوت› ٢. کۆشەر؛ تێکۆشەر؛ تۆکمـە؛ چڕوپڕ؛ کۆشا و بە دواچوو؛ یەکبێژ؛ جـەردی؛ سـوور لـە سـەرکاری خـۆ ‹کـارگر جدّی؛ دانش‌آمـوز جدّی: کارگەری کۆشـەر؛ قوتـابی تێکۆشـەر› ٣. *[مجـازی]* خەتـەر؛ بـڤ؛ بـڤە؛ مەترسـیدار؛ جـێ‌مەترسـی؛ شۆخی‌هەڵنەگر ‹اوضـاع خیلـی جـدی اسـت: بـار و دۆخەکــە زۆر خەتــەرە› ٤. *[مجــازی]* فــەرمی؛ پەیڕەوی داب و نەریت ‹آدم جدی: مرۆی فەرمی›.

**جدیت / ceddîyyat**/: [عربی]/اسـم. ١. *[نامتـداول]* پــێ‌داگــری؛ تۆکمــەیی؛ چڕوپــڕی؛ دۆخ یــان چۆناوچۆنی سوور بـوون لـە سـەر کـار ٢./ـها/ پەل‌وپۆ؛ تێکۆشان ‹برای موفقیت خیلی جدیت کـرد: بۆ سەرکەوتن زۆری پەل‌وپۆ کرد›.

**جدید / cadîd**، ـها/: [عربی] صفت. تازە؛ نوێ؛ نـۆ؛ نەوە ‹همسایەی جدید: دراوسێی تازە›: **تازه**

**جدیـداً / cadîdan**/: [عربـی] قیـد. بـە تـازەیی؛ وەتازەیی؛ وەتازەگی؛ تازەیی.

**جدیدالاحداث / cadîdol'ehdās**/: [عربی] صفت. تازەساز؛ نوێ‌ساز؛ نەوساز؛ تازەچێ‌کـراو ‹خانـەی جدیدالاحداث: خانووی تازەساز›.

**جدیدالاسلام / cadîdol'eslām**/: [عربـی] صفت.

تازەموسوڵمان؛ نەوموسوڵمان؛ نۆبسڵمان.
**جدیدالتأسیس** / cadîdotta'sîs/: [عربی] *صفت.* تازە دروستکراو؛ تازەدامەزراو؛ تازەدانراو ‹مدرسەی جدیدالتاسیس: قوتابخانەی تازەدامەزراو›.
**جذاب** / cazzāb/: [عربی] *صفت.* دڵرفێن؛ دڵراکێش؛ دلکەش؛ خوشیک؛ خوشینک؛ دلگر؛ زۆر جوان و لە بەردڵان ‹قیافەی جذاب: سیمای دڵرفێن›.
**جذابیت** / cazzābîyyat، ـها/: [عربی]/*اسم.* دڵرفێنی؛ دڵراکێشی؛ دڵراکێشەری ‹جذابیت آن مرد بیشتر در حرف زدنش بود: دڵرفێنی ئەو پیاوە زۆرتر لە قسەکردنیدا بوو›.
**جذام** / cozām/: [عربی]/*اسم.* گولی؛ ڕێژە؛ ڕێژ؛ پیسی؛ کووتی؛ کەڕەگۆشە؛ ئالکە؛ نەخۆشیەکی پێستی گیرۆیە زۆرتر لە گەرمیان سەر هەڵدەدا و پتر لووت و لێو و قامکان تووش دەکا و دایاندەوەرێنێ.
**جذامخانه** / cozāmxāne، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* گولخانە؛ جێی ڕاگرتن و تیمارکردنی گولان.
**جذامی** / cozāmî، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* گول؛ خۆرەتێکەوتوو.
**جذب** / cazb/: [عربی]/*اسم.* ڕاکێشی؛ کار و ڕەوتی ڕاکێشان؛ کششت: *الف)* چۆناوچۆنی ڕاکێشانی شتێک بۆ لا یان ناوی شتێکی تر ‹جذب مغناطیسی: ڕاکێشانی میغناتیسی› ب) ڕەوتی گرتنی هەموو یان بەشێک لە شەپۆلی ناردراو لە تەنێکەوە ‹جذب نور: ڕاکێشانی تیشک› ج) ڕەوتی گۆڕان و تێکەڵ بە شتێک بوون یان وەک بەشێکی هاوچەشن لەو شتە دەرهاتن ‹جذب در بدن: ڕاکێشی دە لەشدا›. هەروەها: **جذب شدن؛ جذب کردن**
**جذبات** / cazabāt/: [عربی] جمعِ ☜ **جذبه**
**جذبه** / cazabe/: [عربی]/*اسم.* هێزی دەروونی و ئاکارێک کە ئەبێتە هۆی کارتێکەری بە سەر کەسانیترەوە.
**جذبه** / cazbe، جذبات/: [عربی]/*اسم.* جەزەبە؛ جەزمە؛ حاڵ؛ هەڵەکا؛ سەمای دەروێشان؛ لە هۆش تەکینەوەی دەروێش لە زیکردا؛ هێزی ڕاکێشەری دەروونی کە دەبێتە هۆی هۆگرەتی و گەرەک بوونی زۆری خوا، پیاوچاکان یان شێخان کە زۆرتر لە ناو سۆفیاندا باوە.
**جذر** / cazr، ـها/: [عربی]/*اسم. [ریاضی]* ڕیشە؛ ڕیشەی دووهەمی ژمارەیێ، واتا ئەگەر لە خۆی لێدرێتەوە، ئەو ژمارەیە بە دەست بێ (وەکوو ٣ کە ڕیشەی ٩یە و ٤ کە ڕیشەی ١٦یە).
▣ **جذر گرفتن:** ڕیشەگرتن؛ بەدەس هێنانی ڕیشەی دووهەمی ژمارەیەک.
**جـر** / car(r)/: [عربی]/*اسم.* ١. *[ادبی]* ژێرە؛ نیشانەی ژێرە ٢. *[ادبی]* کار و ڕەوتی کێشان؛ ڕاکێشان ‹جرثقیل: گرانکێش› ٣. *[گفتاری]* چەقە؛ کێشە ‹جر و بحث: کێشە و هەرا›.
**جر** / cer/: *اسم. [گفتاری]* ١. گەڕ؛ گەڕە؛ گز؛ گزە؛ گێچەڵ؛ گەژ؛ گڕنی؛ گغنی؛ گەڕنی؛ لادان لە بنەمای یاری و گۆڕانی بە قازانجی خۆ ‹او همیشه در بازی جر می‌زند: هەمیشە لە کایەدا گەڕ دەکا› ٢. شڕی؛ چڕی؛ دڕاوی؛ دڕیایی؛ دڕیاگی؛ چڕوای.
▣ **جر خوردن:** هەڵدڕان؛ دڕیان؛ دڕیەی.
**جر دادن:** دڕاندن؛ دادڕین؛ چڕکردن؛ چڕاندن؛ لەتکردن ‹کتاب را گرفت و از وسط جر داد: کتێبەکەی گرت و لە ناوەڕاستەوە دڕاندی›.
**جر زدن:** گەڕکردن؛ گز لێدان؛ گزە لێدان؛ گزەکردن؛ گەژکەردەی؛ فێڵ کردن؛ لادان لە گفت و پەیمان (بەتایبەت لە گەمەدا) ‹تو همیشه تو بازی جر می‌زنی: تۆ هەمیشە لە کایەدا گزە دەکەی›.
**جرائد** / carā'ed/: [عربی] ☜ **جراید**
**جرائم** / carā'em/: [عربی] ☜ **جرایم**
**جرأت** / cor'at/: [عربی] ☜ **جُرئَت**

**جراثقال** / carresqāl, carre'asqāl/: [عربی] ☜ **جَرثقیل**

**جراح** / carrāh ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. برینکار؛ برینگەر؛ نەشتەرکار؛ نەشتەرگەر؛ نیشدار؛ نشدار؛ نژدار؛ کرە؛ جەڕاح؛ بژیشکی پسپۆڕی برینکاری ‹جراح قلب: برینکاری دڵ›.

**جراحات** / cerāhāt/: [عربی] جمعِ ☜ **جراحت**

**جراحـت** / cerāhat, carāhat ، ـها؛ جراحات/: [عربی]/اسم. ١. زام؛ برین؛ زامێک کە بە هۆی لێدان و بریانەوە بەدی دێت ‹چند نفر دچار جراحت شدند: چەن کەس زامدار بوون› ٢. *[قدیمی]* چڵک؛ ڕیم؛ هەو؛ زۆخ ‹زخم هنوز جراحت دارد: زامەکە هێشتا چلکی هەیە›.

**جراحی** / carrāhî ، ـها/: [عربی]/اسم. برینکاری؛ برینگەری؛ نەشتەرکاری؛ نژداری: ١. لقێ لە زانستی بژیشکی کە دەپەرژێتە سەر دەرمانی نەخۆشی و خۆشکردنەوەی زامان و لابردنی لک و ... بە دەست و ئامێرگەلی تایبەتی ئەو کارە ٢. کار یان ڕەوتی نەشتەرکاری ‹اتاق جراحی: هۆدەی نەشتەرکاری›.

▣ **جراحی پلاستیک/ ترمیمی:** برینکاری پێست؛ هەڵگرتنی بەشێکی ساغ لە پێست و لە جێ پێستی نەخۆش یان ناحەز دانان.

**جراحی دندان:** برینکاری ددان؛ لقێ لە زانستی ددانبژیشکی کە ئەپەرژێتە سەر دەرمانی نەخۆشی و چاکردنەوەی کەمایەسی ددان و هاروو.

**جراحی صغیر:** برینکاری سووک؛ برینگەری چووک؛ بەشێک لە برینگەری کە پێویستی بە نەخۆشخانە و بێهۆش کردن نیە.

**جراحی عمومی:** برینکاری گشتی؛ ئەو بەشە لە برینگەری کە تایبەتی نیە.

**جراحی کبیر:** برینکاری گەورە؛ ئەو بەشە لە برینگەری کە کاری گەورە و پرمەترسی دەکا.

**جرار** / carrār/: [عربی] صفت. زۆر؛ زەبەند؛ فرە؛ فریە؛ فراوان؛ پڕ؛ پەڕ؛ چڕ و پڕ ‹لشکر جرار: لەشکەری زۆر›.

**جـراره** / carrāre/: [عربی] ☜ عقرب جـرّاره، **عقرب**

**جرایـد** / carāyed/: [عربی] جمـعِ ☜ **جریـده: جرائد**

**جرایم** / carāyem/: [عربی] ١. جمعِ ☜ **جریمه** ٢. جمعِ ☜ **جُرم** * **جرائم**

**جرئت** / cor'at/: [عربی]/اسم. ورە؛ هەیهێز؛ زاوره؛ زاقر: ١. هێز ‹جرئت بلند شدن از جایم را نداشتم: ورەم نەبوو لە جێگەکەم هەستم› ٢. بوێری؛ ئازایی؛ ئازایەتی؛ زات؛ وێر؛ فزە؛ دلێری ‹جرئت کردم و گفتم: تو حق نداری مرا بزور ببری: هەیهێزم کرد وگوتم: تۆ ناتوانی من بە زۆر بەری› *** جرأت**

▣ **جرئت دادن:** دڵدان؛ ورەدان؛ دڵگەرمیدان؛ زاوەر دەی؛ هاندان و هەڵنان ‹به خود جرئت دادم و رفتم بیرون: دڵم دا بە خۆم و ڕۆیشتمە دەرەوە›.

**جرئت داشتن:** زاقر بوون؛ زات بوون؛ ورەبوون؛ بوێر بوون؛ زاوەرە بیەی ‹جرئت نداشت حرفی بزند: زاقری نەبوو قسەیێک بکات›.

**جرئت کردن:** وێران؛ یارەی؛ نەترسان؛ زاتکردن؛ ئازایەتی پێویست بۆ کارێ بە دەست هێنان.

**جرب** / carab/: [عربی]/اسم. گەڕۆڵی؛ گاڵ؛ گرگە؛ گروێ؛ گروەتی؛ گوریاتی؛ نەخۆشیەکی گیرۆی پێستە، زیپکە و خورووی زۆر (بەتایبەت لە دوو دەست) دێنێ.

**جربزه** / corboze ، ـها/: [معرب از فارسی]/اسم. لێهاتوویی؛ توانایی؛ هێژایی و بوێری بۆ جێبەجێکردنی کار ‹او جربزەی مدیریت نداشت: ئەو لێهاتوویی بەڕێوەبەری نەبوو›.

**جرثقیـل** / carresaqîl ، ـها/: [عربی]/اسم. گرانکێش؛ سلینگ؛ جەڕیسەقیل؛ لەگلەگە؛ قۆلینگ؛ کەرەسەیەک بۆ جێبەجێکردنی باری

گران: **جراثقال**

**جرثومه** / corsûme ، ـها: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* میکرۆب؛ خۆره.

▣ **جرثومەی فساد:** ۱. میکرۆبی گەندەڵی ۲. *[مجازی]* هۆی نابوودی و تێکچوون.

**جرجر** / carcar ، ـها: [؟]/اسم. چان؛ جەنجەڕ؛ جەوەن؛ کەرەسەیەک بۆ گێرە کردن کە دەیبەستن بە کەر یان گاوە.

**جرح** / carh/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ۱. کار و ڕەوتی وەلانان یان لابردن ۲. کار یان ڕەوتی زامارکردن.

**جرح‌وتعدیل** / carh-o-ta'dîl ، ـها: [عربی]/اسم. کار و ڕەوتی کەم و زیادکردن یان لابردن و خستنە سەر (بە تایبەت بۆ نووسراوە) ‹نوشتەی خوبی است، اما باید کمی جرح و تعدیل شود: نووسراوەیەکی چاکە بەلام ئەبێ کەم و زیاد بکرێت›.

**جرز** / cerz ، ـها:/اسم. ۱. ئەستوون؛ کۆڵەکەی بەردین یا ئاجۆرینی چوارگۆشە ۲. بنەڕەت؛ بناغە ‹جرز آن دیوار کج است: بنەڕەتی ئەو دیوارە لارە›.

**جرزن** / cerzan ، ـها: صفت. گەڕباز؛ گزدەر؛ گزەدەر؛ گزەون؛ گزیکار؛ گەڕنی‌باز؛ گڕنی‌باز ‹هیچکس دوست ندارد با آدم جرزن رفیق باشد: کەس نایەوێ هەواڵی گەڕباز بێ›.

**جرزنی** / cerzanî/:اسم. گەڕبازی: ۱. گزدەری؛ گزەدەری؛ گزەونی؛ کار یان ڕەوتی گەڕکردن ‹جرزنی خوب نیست، باختی باید بدهی: گەڕبازی باش نیە، داتنا دەبێ بیدەی› ۲. گێچەڵی؛ کاری گەڕباز ‹تو هردفعه می‌بازی و جرزنی می‌کنی: تۆ هەموو جارێ دایدەنێی و گەڕبازی ئەکەی›.

**جرس** / caras ، ـها: [عربی]/اسم. *[ادبی]* زەنگۆڵە؛ زەنگ؛ زەنگە؛ زەنگۆڵ؛ زەنگل؛ زیل ‹بانگ جرس: زرەی زەنگۆڵە›.

**جرعه** / cor'e ، ـها: [عربی]/اسم. قوم؛ قوپ؛ قم؛ قورچ؛ گەپە؛ فڕ؛ وت؛ قڤ؛ فڕ؛ گوب؛ گوڵپ؛ گوڵمیتە؛ ورم؛ ئەو ئەندازە لە تراو کە زار دەیگرێ ‹کسی نبود جرعه‌ای آب به او بدهد: کەس نەبوو قومێ ئاوی پێ‌بدا›.

**جرقه** / caraqqe, ceraqqe ، ـها: [عربی]/اسم. پروسکە؛ پرۆسکە؛ پرێسک؛ چریسک؛ ئاورینگ؛ پزووسکە؛ پزۆزگ؛ بزووسک؛ چەق؛ مۆزریک؛ پرشەی ئاورین ‹جرقەی آتش: پرۆسکەی ئاگر›.

▣ **جرقه زدن:** پرۆسکە لێدان؛ چەخماخە وەشاندن؛ پریسکەدان؛ تەیسینی لەپڕ و تێپەڕ (وەک بەردی چەخماخ).

**جرگه** / carge/:اسم. جەرگە؛ گەرزک؛ ڕیز و ئەڵقەیەک لە مرۆ یان گیانلەبەر.

▣ **جرگه کردن:** گەرزک دان: ۱. چەمەرە بەستن؛ پەیکەدان؛ بازنە بەستن بە دەور شتێکدا ۲. گەمارۆدان؛ پەڕانپەری شتێ داگرتن.

**جرم** / cerm ، ـها؛ أجرام/: [عربی]/اسم. ۱. تەن؛ جرم؛ ئەندازەی ماکی کۆوە بوو لە شتێکدا ۲. بار؛ خڵت؛ قاڵ؛ بەڵخ؛ شتێک کە وردە- وردە بە سەر شتێکی‌ترەوە دەنیشێ و دایدەپۆشێ (وەک بنی دەفر و دیوارەی کتری و سەماوەر).

▣ **جرم اتمی:** *[شیمی]* کێشی ئەتومی؛ ڕادەی ماکی هەر ئەتومێک لە حاند ۱/۶۰ی ماکی کەربونی ۱۲ ($^{12}C$).

**جرم آسمانی:** هەر تەنێکی ئاسمانی کە ببینرێت (وەکوو خۆر، مانگ و ئەستێرەکان).

**جرم حجمی:** *[شیمی]* تۆکمەیی؛ تۆلایی؛ چڕی؛ چڕوپڕی؛ کێشی هەر ماکێک لە سانتی‌میتریکی چوارپاڵوودا.

**جرم ملکولی:** *[شیمی]* کێشی مولکوول؛ کێشی سەرجەمی ئەتومگەلی پێکهێنەری مولکوولێک.

▣ **جرم گرفتن:** بێخ‌گرتن؛ بەڵخ‌گرتن؛ جرم‌گرتن؛ نیشتنی ماکێک لە سەر شتێ

‹سماور جرم گرفته بود: سەماوەرەکە بنخی گرتبوو›.

**جرم** / corm ، ـها؛ جرایم/: [عربی]/*اسم*. تاوان؛ کەتن؛ گوناه ؛ کارێ کە قانوون بە نارەوای زانیوە ‹وقتی کسی مرتکب جرمی می‌شود باید منتظر مجازات باشد: کاتێ کەسێ تووشی تاوانێ دەبێ، ئەبێ چاوەڕوانی سزا بێ›.

▣ **جرم سیاسی**: تاوانی ڕامیاری؛ کەتنی سیاسی؛ تاوانێ کە دژی دووزەنەی سیاسی وڵاتە.

**جرم مطبوعاتی**: تاوانی ڕۆژنامەوانی؛ تاوانێ کە بە هۆی نووسین و بڵاو کردنەوەی وتارێک ڕووی داوە.

**جرم نظامی**: کەتنی/ تاوانی چەکداری؛ تاوانێ کە بە هۆی سەرپێچی لە قانوون یان فەرمانی چەکداریەوە ڕووی‌داوە.

**جرمانه** / cormāne ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. تاوان؛ جەریمە.

**جرم‌شناختی** / cormšenāxtî/: [عربی/ فارسی] *صفت*. تاوان‌ناسینی؛ پێوەندیدار یان سەر بە تاوان ناسیەوە.

**جرم‌شناسی** / cormšenāsî/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. تاوان‌ناسی؛ زانستی ورد بوونەوە لە چۆنیەتی سەرهەڵدانی تاوان و کاری تاوانبار، شێوازگەلی دۆزینەوەی تاوان و بەرگری لە دووپاتە و بڵاو بوونەوەی. هەروەها: **جرم‌شناس**

**جرمگیر** / cermgîr ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. بەڵخگر؛ ماکێکی کیمیاوی یان ئامێرێ کە بۆ لێکردنەوەی بەڵخی ناو سەماوەر و کتری و... بە کار دەڕوا.

**جرمگیری** / cermgîrî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. بەڵخگری؛ کار یان ڕەوتی سڕینەوەی ماکی لاوەکی بن‌گرتوو بە ڕووی شتێکەوە. هەروەها: **جرمگیری شدن؛ جرمگیری کردن**

**جرواجر** / cervācer/: *صفت.[گفتاری]* شڕ و وڕ؛ شڕوشیتاڵ؛ شی‌وشیتاڵ؛ لەت‌وپار؛ لەت‌وپەت؛ لەت‌وکوت؛ کوت‌ولەت ‹روزنامه را از دستم گرفت و جرواجر کرد: ڕۆژنامەکەی لە دەستم سەند و شڕ و وڕی کرد›: **جرُوواجر**

**جروبحث** / carr-o-bahs ، ـها/: [عربی]/*اسم*. کێشە و هەرا؛ چەقە و هەرا؛ دەم لە دەمانێ؛ چەقەچەق ‹بنشینید و به آرامی حرفتان را بزنید! چرا این‌قدر جروبحث می‌کنید؟: دانیشن و بە هێمنی قسەکانتان بکەن! بۆ ئەوندە کێشەوهەرا دەکەن؟›.

**جرُوواجر** / cer-o-vācer/ ☜ **جرواجِر**

**جره** / carre ، ـها/: *اسم*. تۆنگە؛ جارە؛ جەرە؛ گۆزەی ئاوی سواڵەت کە دەم و بنەکەی گچکەیە.

**جره** / corre ، ـها/: *اسم*. شاباز؛ بازی سپی.

**جری** / carî/: [عربی] *صفت*. ڕوودار؛ ڕوو هەڵماڵاو؛ بێ‌پەروا؛ بێ‌شەرم ‹این پسر خیلی جری شده و حرف کسی را گوش نمی‌کند: ئەم کوڕە زۆر ڕوودار بووە، گوێ بە قسەی کەس نادا›.

**جریان** / car(a)yān ، ـها/: [عربی]/*اسم*. ڕەوتانە: ۱. چۆنیەتی گەڕان؛ گەڕیان؛ بزووتنی تراو ‹جریان آب: گەڕانی ئاو› ۲. دەسگەڕ؛ کار یان ڕەوتی دەساودەس بوونی شتێک ‹جریان پول: ڕەوتانەی پارە› ۳. /ـات/ زنجیرەیەک لە کار یان ڕووداوگەلی لە شوێن یەک بۆ گەیشتن بە ئەنجامێک ‹جریان دادگاه: ڕەوتی دادگا› ٤. چۆنیەتی ڕووداو یان زنجیرەیەک لە ڕووداوان ‹جریان کار از این قرار بود: ڕەوتانەی کارەکە ئاوا بوو›.

▣ **جریان الکتریسیته**: ڕەوتی کارەبایی؛ گەڕانی بەرق: **جریان برق**

**جریان برق** ☜ **جریان الکتریسیته**

▣ **جریان داشتن**: ۱. ڕەوان بوون؛ وەگەڕ بوون؛ بە خوڕ بوون ‹آب در لوله‌ها جریان داشت: ئاو لە لولەکاندا لەگەڕ بوو› ۲. لەگەڕ بوون؛ لەگەڕان بوون؛ لەگەڕدا بوون؛ لەگەڕاندا بوون؛ لە هات‌وچۆدا بوون ‹در داخل این اتاق هوا جریان

ندارد: له نێو ئەم هۆدەیەدا هەوا ناگەڕێ›. **در جریان بودن** ۳. بەردەوام بوون ‹زندگی جریان دارد: ژیان بەردەوامە›. هەروەها: **جریان یافتن**

**به جریان افتادن:** وەگەڕ کەوتن؛ دەسپێکردنی ڕەوت؛ هاتنە ئاراوە ‹پرونده به جریان افتاد: دۆسیەکە وەگەڕ کەوت›. هەروەها: **به جریان انداختن**

**در جریان بودن:** ۱. له گەڕ بوون؛ لە گەڕاندا بوون ۲. باو بوون؛ بەبرەو بوون ‹پول نقره تا سال ۱۳۳۱ در جریان بود: پارەی زێوین هەتا سالی ۱۳۳۱باو بوو› ۳. ئاگادار بوون؛ هایدار بوون ‹پدرش هم در جریان است و همه چیز را می‌داند: باوکیشی ئاگادارە و هەموو شتێک دەزانێ›. هەروەها: **در جریان گذاشتن**

**جریب** / carîb/: [معرب از فارسی] *اسم. [قدیمی]* دەدونم؛ یەکەی ڕووبەر بۆ زەوی کە بە پێی ناوچە، لە ۸۰۰ تا ۴۰۰۰ میتری چوار گۆشە دەگۆڕا، تا بە گوێرەی قانوون بەرانبەری یەک هیکتار (۱۰۰۰۰ میتری چوارگۆشە) دەسنیشان کرا.

**جریحه** / carîhe/: [از عربی] *اسم. [نامتداول]* زام؛ برین؛ زەخم؛ زامێ کە بە هۆی شتێکی تیژەوە (وەکوو چەقۆ) بەدی دێ.

**جریحه دار** / carîhedār/: [از عربی/ فارسی] *صفت. [ادبی]* ڕیش؛ زامدار؛ زامار؛ برینار ‹احساسات جریحه‌دار: دەروونی ڕیش›. هەروەها: **جریحه‌دار کردن**

**جریده** / carîde ، ـها؛ جراید/: [عربی] *اسم. [قدیمی]* ڕۆژنامە.

◘ **جریدەی اعمال:** تۆماری کردەوە؛ یە لەدووی یەک نووسراوی هەر کارێک کە کراوە.

**جریمه** / carîme ، ـها؛ جرایم/: [عربی] *اسم.* جەریمە؛ تاوان؛ سزا: ۱. تاوان؛ پارەیەک کە لە تاوانبار یان هەڵەکار لە سزای کردەوەی نالەبارێ کە کردوویە دەسێنرێت ۲. کارێ کە هەڵەکار دەبێ وەک سزا ئەنجامی بدا ‹دیر آمده‌ای جریمه‌ات این است که ظرفها را بشویی: دێر هاتوویی لە تاوانیدا دەبێ قاپ و قاچاغەکە بشۆی›.

◘ **جریمەی نقدی:** تاوان؛ تاوانی نەختی؛ پارەیێک کە بە ناوی تاوان لە تاوانی دەسێنرێ.

◘ **جریمه دادن:** جەریمەدان؛ تاوان دان ‹به خاطر کاری که کردم جریمه دادم: له بەر کارێ کە کردم جەریمەم دا›.

**جریمه کردن:** جەریمەکردن ‹به خاطر رعایت نکردن قانون، پلیس او را جریمه کرد: له بەر ڕەچاو نەکردنی قانوون، پولیس جەریمەی کرد›.

**جریمه نوشتن:** جەریمە نووسین؛ تاوان نووسین.

**جرینگ** / girîng, gerîng/ ☜ **جیرینگ**

**جرینگی** / girîngî, gerîngî/ ☜ **جیرینگی**

**جز** / cez(z)/: *صوت.* ۱. چز؛ چزە؛ قرچە؛ دەنگی وێک کەوتنی تراو و ئاور ۲. *[مجازی]* کزە؛ سووتانەوە ‹جز جگر: کزەی جەرگ›.

**جز** / coz/: *حرف.* جگە؛ بێجگە؛ بێژگە؛ بەجگە؛ بێج؛ چز؛ ژبلی؛ بژلی؛ بەدەر؛ بژ؛ بیژی؛ ئیللا؛ خەیر؛ بل ‹در آنجا جز من کسی نمانده بود: لەوێدا جگە لە من کەس نەمابوو›: **بجز**

**جزا** / cazā/: [عربی] *اسم.* ۱. گۆڕ؛ سزا؛ جزیا؛ جەریمە؛ تاوانی کاری خراپ ۲. پاداش؛ پاداشت.

◘ **جزای خیر:** پاداشی خێر؛ جەزای خێر؛ پاداشی چاکە.

◘ **جزا دیدن:** ۱. سزاکێشان ۲. پاداش گرتن.

**بە جزای عمل رسیدن:** هەرچی خواردن ڕینەوە؛ سزا دیتنەوە؛ سزای ئاکار دیتن؛ بە سزای خۆ گەیشتن.

**جزائر** / cazā'er/: [عربی] ☜ **جزایر**

**جزائی** / cazā'î/: [عربی] ☜ **جزایی**

**جزایر** / cazāyer/: [عربی] جمع ☜ **جزیره:**

**جزائر**
**جزایی** / cazāyî، اجزا/: [عربی] *صفت.* سزایی؛ سەر بە سزا: **جزائی**
**جزء**[1] / 'coz، اجزا/: [عربی]*/اسم.* بەش؛ پارچە؛ پاژ؛ پارە؛ پار؛ بڕ؛ پەرچە؛ لەت؛ لەتک؛ ڕیز؛ وارە؛ دۆگە؛ بەشێ لە چەند بەش ‹دو جزء از ده جزء: دوو بەش لە دە بەش›.
▣ **جزء به جزء**: یەکبەیەک؛ پاژبەپاژ؛ وردبەورد؛ ورد ـ ورد؛ دۆگەبەدۆگە ‹همه چیز را جزء به جزء یادداشت کردم: هەموو شتێکم یەکبەیەک نووسی›.
جزء **لاینفک**: بەشی لێنەکراو؛ پاژی لێ نەبڕاو.
**جزء**[2]: *صفت.* خواردەست؛ بە کار یان پلەی کارگێری نزمەوە ‹کارمند جزء: مووچەخۆری خواردەست›.
**جزئی**[1] / coz'î/: [عربی] *صفت.* بەشەکی؛ پاژەکی؛ کەم. بەرانبەر: **کلّی** ‹زیان جزئی: زیانی بەشەکی›.
**جزئی**[2]: *قید.* تۆزێ؛ تۆزێک؛ تۆزقالێک؛ کەمێک؛ کوچێو ‹دستش جزئی خراش برداشت: دەستی تۆزێ رووکا›.
**جزئیات** / coz'îyyāt/: [عربی]*/اسم.* وردەکاری؛ بابەت یان شتگەلی گچکەی لە پەراوێز ‹من از جزئیات خبر ندارم: من لە وردەکاریەکان بێخەبەرم›.
**جزر** / cazr، ـها/: [عربی]*/اسم.* داکشە: ۱. دیاردەی چوونە خواری ئاوی دەریاکان بە هۆی هێزی ڕاکێشەری خۆر یان مانگەوە ۲. نزمترین ڕادەی کۆمای ئاو لە ڕۆژدا.
**جزر و مد** / cazr-o-madd، ـها/: [عربی]*/اسم.* هەڵکشە و داکشە؛ ڕەوتی هەڵکشان و داکشان؛ هاتنە بان و چوونە خواری گەرایگەڕی ڕۆژانەی ئاوی ئوقیانووس، زەریا و گۆلانی گەورە.
**جزع** / 'caza/: [عربی]*/اسم.* [ادبی] خۆنەگری؛ بێقەراری؛ بێنتمی؛ بێهەدایی.
**جزع** / 'caz/: [عربی]*/اسم.* بۆق؛ پۆق؛ زەق؛ بلۆق؛ چاوی دەرپەڕیو.
**جزع‌وفزع** / 'caza'-o-faza، ـها/: [عربی]*/اسم.* *[ادبی]* شین و شەپۆڕ؛ هاوار و داد؛ هاوار و گریان بۆ یارمەتی خواستن ‹جزع‌وفزع مادرش دل آنها را به دست آورد: شین و شەپۆڕی دایکی دڵیانی نەرم کرد›. هەروەها: **جزع و فزع کردن**
**جزغاله** / cezqāle/: *صفت.* *[گفتاری]* چزڵیک؛ چزیلک؛ چزێلک؛ جزیلک؛ ژزلیک؛ چڵەوزی؛ کزک؛ کسک؛ بەورەو؛ سووتک؛ تەواو سووتاوی هەڵقرچاو ‹تا خودم را رساندم، گوشت جزغاله شده بود: تا خۆمم گەیاند؛ گۆشتەکە ببووە چزڵیک›. هەروەها: **جزغاله شدن؛ جزغاله کردن**
**جزگیر** / cozgîr، ـها/: *اسم.* جوزەگر؛ کەرەسەیەک بۆ باز هێشتنەوەی کتێب یان پەڕاوە.
**جزل** / cazl/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* سوار؛ پاراو؛ خاوەن پتەوی لە باری وتە و واتاوە.
**جزم** / cazm/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* ۱. قایم؛ پتەو ۲. نەگۆڕ؛ گرساو.
**جزم‌اندیش** / cazmandîš، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بیرگرساو: ۱. خاوەن هۆگرەتی بە ئەندێشەی نەگۆڕ ۲. خۆگرتوو بە پێداگری لە سەر بیر و باوەڕی کۆن و لاسار لە بەرانبەر ئەو بەڵگانەوە کە نادروستی باوەڕەکەی دەسەلمێنن.
**جزم اندیشی** / cazmandîšî/: [عربی/ فارسی]*/اسم.* بیرگرساوی: ۱. پێچەقێنی لە سەر بڕوایەک، بەتایبەت کاتێ کە ناڕەوا و نەسەلماو بێت ۲. ڕوانگە یان بنەمای هزری دامەزراو لە سەر بڕوای نەسەلماو.
**جزمی** / cazmî/: [عربی] *صفت.* نەگۆڕ؛ خۆگرتوو ‹فکر جزمی: بیری نەگۆڕ›.
**جزو** / cozve/: [از عربی] *حرف.* لە؛ جە؛ ژ؛ نە ‹او جزو تروریستان است: ئەو لە ڕەش‌کوژانە›.
**جزوات** / cozavāt/: [از عربی] جمعِ ☜ **جُزوه**
**جزوه** / cozve، ـها؛ جُزَوات/: [از عربی]*/اسم.*

نامیلکە: ١. کتێبێکی چکۆلە کە لـە ٤٨ لاپـەڕە کـەمتر بێـت ٢. وانـە؛ دەرسـێک کـە مامۆسـتا دەیڵێ و خوێندکاران دەینووسن ‹استاد دیـروز بـە ما جزوه گفـت: مامۆسـتا دوێکـە وانـەی پـێ وتـین› ٣. بەشێ لە کتێبێک.

▣ **جزوه گفـتن**: وانـەگوتن؛ وتنـەوەی وانـە بـۆ خوێندکار. هەروەها: **جزوه نوشتن**

**جزووەدان** / cozvedān ، ـهـا/: [از عربـی/ فارسـی] *اسم.* پسوولەدان؛ نامیلکەدان؛ فایل؛ کەرەسەیەک بۆ دانانی چەند پووشە تێدا.

**جزوه‌کش** / cozvekeš ، ـهـا/: [از عربـی/ فارسـی] *اسم.* کەسێ کە جزمەکانی قورعان بۆ خوێندنەوە لە نێـوان ئامادەبوانـدا بـلاو دەکاتـەوە و دوایـی کۆیان دەکاتەوە.

**جزیرگـان** / cazîregān/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. *[جغرافیـا]* دوڕگـەیان؛ گراڤـان؛ کۆمەڵـە گـراڤ؛ کۆمەڵی دوڕگەی لە پەنای یەک.

**جزیـره** / cazîre، ـهـا؛ جزایـر/: [عربـی]/اسـم. ١. دوڕگە؛ دڕگە؛ دوڕە؛ دوڕاجـە؛ گـراڤ؛ گـراوە؛ ئار؛ ئاد؛ گزیرتە؛ ناڤرە؛ چزیـر؛ چزیـرە؛ جـەزیرە؛ جزیرە؛ چزیرگە؛ جێزوک؛ بەشێ لە وشکانی کـە دەوراندەوری ئاوە و گچکەتر لە قاڕەیە ٢. گراڤە؛ *[مجـازی]* شوێنێ دوورەدەس یان لەندێ کـە لـە دوڕگە دەکا.

▣ **جزیرەی آتشفشانی**: دوڕگەی گـڕکانی؛ ئـارێ کـە بـە هـۆی سـەر هەڵـدانی گڕکانـەوە پێکهاتووە.

**جزیـرەی آرامـش**: *[مجازی]* هۆبـەی هـەدان؛ شوێنێ (وەک وڵاتێـک) کە ئارام و بێدەنـگ و دوورەقڕەیە.

**جزیـرەی مرجـانی**: دوڕگـەی مـەرجانی؛ دوڕگەی بەدیهاتوو لە لاشەی مەرجان.

**جزیل** / cazîl/: [عربـی] *صفت. [ادبـی]* ١. سـوار؛ پتـەو (بەتایبـەت لەمـەڕ وتـەوە) ٢. زۆر؛ زەوەنـد؛ زەمەن؛ زەبەن؛ فرە؛ فراوان؛ فریە؛ گەلـەک ‹اَجـر جزیل: پاداشی زۆر›.

**جزیه** / caz(i)ye, cezye، ـهـا/: [معـرب از آرامـی] *اسـم. [قـدیمی]* سـەرانە؛ پیتـاکی تایبـەت کـە ناموسوڵـمانان دەبـوا بـە فەرمانـڕەوای موسوڵمانانیان بدایە.

**جسارت** / cesārat, casārat ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ١. دلێری؛ ئازایـەتی؛ بـوێری؛ بێبـاکی ‹وطـن، محتاج شهامت و جسارت است: نیشتمان، پێویستی بە گەڕناسـی و دلێرییـە› ٢. گوسـاخی؛ گوسـتاخی؛ ڕووداری ‹ببخشید، قـصد جـسارت نداشـتم: ببـوورن، گەرەکم نەبوو ڕووداری بکەم›.

**جـست** / cast, cest/:اسـم. بـاز؛ واز؛ وەز؛ بـازد؛ پەڕشـت؛ قەڵـباز؛ قەڵـبەز؛ قـەفاز؛ قەڤـز؛ وزاق؛ باز-باز؛ گومەتە؛ گوژم؛ دەقەلۆز؛ فنجک؛ لیتـک؛ چلاپە؛ چرتک؛ کـار و ڕەوتی بـە هوژمـەوە خـۆ بەرەو پێش هاویشتن.

▣ **جست زدن**: پەڕین؛ وزاقدان؛ پڕەی؛ باز بردن؛ باز دان؛ ڤەرسـان؛ لنگـە ئەسـتەنە؛ قـەفازتن؛ هلجنقین.

**جستار** / costār ، ـها/:اسم. وتار؛ وتاری پەیدۆزانە لە بارەی بابەتێکەوە.

**جـستجو** / costecû, costocû ، ـهـا/:اسـم. کرکاش؛ کروکاش؛ سەنگوسۆژن؛ گـردیسـەر؛ مل‌ومۆ؛ بنجۆری؛ مـتمـلوو؛ کـار و ڕەوتی دانـە پەی؛ دۆزیـن؛ لێگـەڕیان؛ بۆگـەڕان؛ وەشـکیان؛ گێڕایش؛ گەڕان بۆ دۆزینەوەی شتێ.

**جستن** / castan, cestan/: مـصدر. لازم. // **جـستی**: بازتدا؛ **می جهی**: بـازدەدەی؛ **بجـه (جـست بـزن)**: بازدە// ١. بازدان؛ هەڵبەزین؛ وزاقـدان؛ ڕاپـەڕین ‹از بام جستن: لە بانـەوە بـازدان› ٢. ڕزگـار بـوون؛ خەڵـسان؛ ڤەرەسـتن؛ ڤەرسـین؛ ڕاورانـدن؛ ڕەستەی؛ ڕەها بیەی ‹از دسـت کـسی جـستن: لـە دەسـتی کەسـێکەوە ڕزگـار بـوون›. هـەروەها: **جستنی**

■ صفت فـاعلی: **جهنده** (بـازدەر)/ صـفت مفعـولی:

جَسته(ـ)/ مصدر منفی: نَجَستن (باز نەدان)

**جستن** / costan/: مصدر. متعدی. // **جستی**: پشکنیت؛ **می‌جویی**: دەپشکنی؛ **بجو(ی)**: بپشکنە// ١. پشکنین؛ هلکەوشاندن؛ بۆ گەڕان؛ گەڕیان؛ دانە پەی؛ سەنگوسۆژن‌کردن؛ وشکنەی؛ گێلای؛ گێرایش ‹گفتند، یافت می‌نشود جستەایم ما: گوتیان کە دەست ناکەوێ، ئێمە پشکنیومانە› ٢. [گفتاری] دۆزینەوە؛ پەیدا کردن؛ یۆستەیوە ‹کار جستن: کار دوزینەوە›. هەروەها: **جستنی**

■ صفت فاعلی: **جوینده** (پشکێنەر)/ صفت مفعولی: **جسته** (پشکێنراو)/ مصدر منفی: **نَجُستن** (نەپشکان)

**جست‌وخیز** / cast-o-xîz، ـها/: اسم. هەڵبەز‌ـ دابەز؛ هەڵپەڕ‌ـ داپەڕ؛ هەڵتەک‌ـ داتەک؛ کار یان ڕەوتی بەملا و بەولادا پەڕان؛ هەڵبزۆقان ‹بچەها توی اتاق جست و خیز می‌کردند: منداڵەکان لە دیوەکەدا هەڵبەز‌ـدابەزیان دەکرد›.

**جسته‌ـ‌گریخته** / castegorîxte/: قید. جاروبارە؛ جاروبار؛ پرش‌وبلاو؛ گاگاییوە؛ بە شێوەی تاو‌ـ تاو ‹جسته‌ـ‌گریخته کارهایی می‌کرد: جاروبارە کارگەلێکی دەکرد›: **جسته‌وگریخته**

**جسته‌وگریخته** / caste-vo-gorîxte/ ☜ **جسته‌ـ‌گریخته**

**جسد** / casad، ـها؛ اجساد/: [عربی] اسم. کەلاک؛ کەلاخ؛ لاشە؛ لاک؛ تەرم؛ جەندەک؛ لاوەلەش؛ زەمەز؛ کەلەستەی گیانەوەران، بەتایبەت کەلاکی گیانداری مردوو ‹جسد انسان: کەلاکی مرۆڤ›.

**جسر** / cesr، ـها/: [عربی] اسم. [نامتداول، قدیمی] پرد؛ پردە؛ پردی؛ پر؛ پێل؛ ڕێبازی دروست‌کراو بە سەر ئاودا.

**جسم** / cesm، ـها؛ اجسام/: [عربی] اسم. تەن: ١. ماک؛ ئەوەی کە خاوەن بارسایی و کێش بێت و جێگایەک بگرێتەوە ‹جسم جامد: تەنی نەگۆڕ› ٢. لەش؛ لەخت؛ گۆڤدە؛ گۆدە؛ کەلەستە؛ پەیکەر؛ لار؛ قەوارە؛ بەدەن؛ کەلاخ؛ قالب؛ کەلەستەی ماکی ژینەوەر، بەتایبەت مرۆڤ یان گیاندار ‹جسم و جان: تەن و گیان›.

◙ **جسم جامد**: ماکی خۆگر؛ ئەوەی خاوەن بیچم و بارسایی ڕوون و نەگۆڕە.

**جسم ساده**: توخم؛ هێمان؛ ماکێک کە تەنیا لە یەک جۆر ئەتوم پێکهاتووە.

**جسم سیاه**: تەنی ڕەش؛ تەنێک کە بتوانێ هەموو تیشکێک وەرگرێت و هیچ تیشکدانەوەیەکی نەبێ: **سیەجسم**

**جسم صلب**: [مکانیک] تەنی ڕەق/ پتەو؛ تەنێک کە شکڵ و قەوارەیەکی سفت و نەگۆڕی هەیە.

**جسم مرکب**: تەنی لێکدراو؛ تەنی تێکەڵاو لە چەند توخمی کیمیایی بە ڕێژەی قورسایی دیاریکراو لە هەر کام.

**جسماً** / cesman/: [عربی] قید. بە جەستە/ لەش؛ لە لەشدا؛ بە تەن؛ لە لایەنی جەستەوە ‹او جسماً سالم بود: ئەو بە لەش ساغ بوو›.

**جسمانی** / cesmānî/: [عربی] صفت. لەشی؛ جەستەیی؛ سەر بە لەش. بەرانبەر: **روحانی** ‹درد جسمانی: ئێشی لەشی›.

**جسمی** / cesmî/: [عربی] صفت. تەنی؛ کەلەستەیی؛ جەستەیی؛ لەشی؛ پێوەندیدار بە لەشەوە ‹ناراحتی جسمی: ئازاری تەنی›.

**جسور** / casûr، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. ١. بوێر؛ دلێر؛ ئازا؛ گەڕناس؛ بێباک؛ نەترس؛ گوڕێخ؛ چاونەترس ‹مرد جسوری بود: پیاوێکی بوێر بوو› ٢. ڕوودار؛ گوساخ؛ گوستاخ؛ بێپەروا؛ دەل؛ دڕ؛ بێحەیا.

**جسورانه**[1] / casûrāne/: [عربی/ فارسی] صفت. ١. ئازایانە؛ بوێرانە؛ دلێرانە؛ بێباکانە؛ گوڕێخانە ‹حرکت جسورانە: تەکانی ئازایانە› ٢. ڕووردارانە؛ گوساخانە؛ بێپەروایانە ‹رفتار جسورانە: ئاکاری ڕووردارانە›.

**جسورانه**[2]: قید. ١. ئازایانە؛ بوێرانە؛ بە گوڕێخی

‹جسورانه سخن گفت: ئازایانه قسه‌ی کرد›

۲. ڕووداڕانه؛ گوساخانه؛ به ڕووداریه‌وه؛ ڕێلاسانه؛ گۆرساقانه ‹جسورانه آمد داخل: به ڕووداریه‌وه هاته ژوور›.

**جشن** / cašn ، ـها/: اسم. جێژن؛ جه‌ژن؛ جه‌ژنه؛ یه‌زن؛ جێژنه؛ گێژن؛ ئایینێک بۆ ڕێزلێنانی ڕووداوێکی ڕاسته‌قینه یان دێرۆکی.

▣ **جشن تولد:** جه‌ژنی له دایک بوون.

**جشن سالگرد:** جێژنی ساڵه‌هات؛ جه‌ژنێک به بۆنه‌ی ساڵه‌هاتی ڕووداوێکی گرنگ، بۆ بنه‌ماڵه، کۆمه‌ڵ یان وڵاتێک.

**جشن سال‌نو:** جه‌ژنی سه‌ری ساڵ.

**جشن عروسی:** زه‌ماوه‌ند؛ زه‌ماوه‌ن؛ زه‌ماوه‌نگ؛ گۆوه‌ند؛ گۆبه‌ند؛ گۆڤه‌ند؛ هه‌ڤالا؛ شایی؛ شاهینه‌ت؛ داوه‌تی بووک هێنان؛ به‌زمی بووک گوێزانه‌وه.

**جشن مذهبی:** جه‌ژنی ئایینی؛ جێژنێ که شوێنکه‌وتووانی ڕێبازێکی ئایینی، به داب و نه‌ریتی خۆیان به‌ڕێوه‌ی ده‌به‌ن.

**جشن ملی:** جێژنی نه‌ته‌وایه‌تی؛ جه‌ژنێ که نه‌ته‌وه‌یه‌ک به بۆنه‌ی ڕووداوێکی مێژوویی یان فۆلکلۆریه‌وه به‌ڕێوه‌ی ده‌به‌ن.

**جشن یادبود:** جێژنی بیره‌وه‌ری؛ جه‌ژنێ بۆ به سه‌رکردنه‌وه‌ی ڕووداوێک.

▣ **جشن گرفتن:** جه‌ژن‌گرتن؛ به‌ڕێوه‌بردنی جه‌ژن.

**جشنواره** / cašnvāre ، ـها/: اسم. مێهره‌گان؛ مێهره‌جان؛ جه‌ژنێ فه‌رهه‌نگی که له ماوه‌یه‌کی دیاریکراودا به‌ڕێوه ده‌چێ.

**جعاله** / ce'āle/: [عربی] اسم. [حقوق] کارانه؛ کارمز؛ حه‌قده‌ست؛ حه‌قده‌س؛ ڕۆژانه.

**جعبه** / ca'be ، ـها/: [عربی] اسم. جابه؛ سندۆق:

۱. ده‌فری چوارپاڵوویی سه‌ر به‌سراو بۆ ڕاگرتن یان هه‌ڵگرتنی شتێ ۲. قوتوو؛ قوتوه.

▣ **جعبه‌ی اعلانات:** قاپ/ تابلۆی ئاگاداری؛ جابه‌ی ئاوالا یان به ده‌رکی شووشه‌یی‌یه‌وه که له شوێنێ داده‌مه‌رزێ و زانیاری و ئاگاداری و خه‌به‌ری تایبه‌ت به خوێنه‌رانی تێ ده‌خرێت.

**جعبه‌ی سیاه:** قوتووه ڕه‌ش؛ ئامرازێکی تۆمارگه‌ر له فڕۆکه‌دا که هه‌موو کار و ڕووداوێکی تێدا تۆمار ده‌بێ، بۆ زانینی هۆی داکه‌وتنی فڕۆکه که‌ڵکی لێ ده‌گرن.

**جعبه‌ابزار** / ca'be'abzār ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. جێ‌ئامێر؛ جابه‌ی ئامێر؛ سندۆقی جێ هه‌موو جۆره هاچه‌ر و گاز و چه‌کوچ و...

**جعبه‌ای**[1] / ca'be'î/: [عربی] صفت. جابه‌یی؛ خاوه‌ن جابه ‹خرمای جعبه‌ای: خورمای جابه‌یی›.

**جعبه‌ای**[2]: قید. ۱. به سندۆق؛ به جابه؛ به شێوه‌ی به‌سته‌یی ‹پرتقال را جعبه‌ای می‌فروختند: پرته‌قاڵیان به سندوق ده‌فرۆشت› ۲. جابه‌یێ؛ قووتیله‌یه‌ک؛ هه‌ر جابه ‹خرما جعبه‌ای هزار تومان کمتر نیست: خورما جابه‌یێ که‌متر له هه‌زار تمه‌ن نیه›.

**جعبه‌آیینه** / ca'be'āy(î)ne ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. ۱. [قدیمی] قاپ ئاوێنه؛ جابه‌یه‌ک که به ملیه‌وه هه‌ڵده‌واسن و شتومه‌کی فرۆشی تێدایه و به کڕیاری نیشان ده‌ده‌ن ۲. جامخانه؛ ویترین.

**جعبه‌تقسیم** / ca'betaqsîm ، ـها/: [عربی] اسم. جابه دابه‌ش/ په‌رش؛ جابه‌ی دابه‌شینی کاره‌با؛ جه‌عبه‌یێکی سه‌ردار بۆ هاتنه‌وه سه‌ر یه‌ک یا جیا بوونه‌وه‌ی سیمی به‌رق له شوێنگه‌لێکدا که ده‌بێ فاز و نوول په‌رده‌ژ بێ.

**جعبه‌دنده** / ca'bedande ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. جابه‌ی ده‌نده؛ گیربۆکس.

**جعبه‌فرمان** / ca'befarmān ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. جابه‌ی فه‌رمان؛ جابه ده‌نده‌یه‌ک له ئاخری میله‌ی فه‌رمانی ماشیندا که سووڕی فه‌رمان ده‌گوێزێته‌وه بو چه‌رخه‌کان.

**جعـد** / ca'd ، ـهـا/: [عربـی]/اسم. [ادبی] لـوولی؛ گرژی؛ کرژی ‹جعد گیسو: لوولی ئەگریجە›.

**جعز** / ce'ez/: [؟] ☜ **گئز**

**جعفری** / ca'farî/: [عربی]/اسم. ۱. ـ/ـها/ جـافری؛ جەعفەری؛ مەعدەنووس؛ مـەدەنووس؛ مەیـدنۆز؛ زورک؛ گێژنـــۆک؛ مـــەیلنـــۆز؛ بەقـــدەنووس؛ شانۆکەباخی؛ شانۆکی؛ گیایەکی دووسالانی گەلا پەل- پەلی گوڵ پچووکی سـەوزکارە کـە تـام و بۆنێکی خۆشی هەیە و سەوزی خـواردنێکی زۆر ناسراوە ۲. ☜ شیعەی جعفـری، **شـیعە** ۳. ☜ مار جعفری، **مار**

**جعــل** / ca'l/: [عربـی]/اسـم. کـار یـان ڕەوتی هەڵبەسـتن؛ دروسـتکـردنی شـتی درۆیـین، بەتایبەت کاری لێدروستکـردنی بەڵـگەگەلی ڕەسمی بایەخدار.

▣ **جعل اسناد:** دروستکردنی بەڵگەی درۆینە.

**جعل اکاذیب:** درۆ هەڵبەستن.

**جعل امضا:** دروستکردنی واژۆی درۆینە.

▣ **جعـل کـردن:** هەڵبەسـتن؛ دروسـتکـردنی شتی درۆ.

**جعل** / co'al/: [عربی] ☜ **سِرگینغلتان**

**جعلنق** / co'alnaq ، ـها/: صفت. پەست؛ خوێـڕی؛ خۆڕی؛ سووکوچرووک (جنێویکە).

**جعلـــی** / ca'lî/: [عربـی] صـفت. هەڵبەســـتراو؛ هەڵبەسیاگ؛ قەڵب؛ چرووک ‹سند جعلی: بەڵگەی هەڵبەسراو›.

**جعلیـات** / ca'lîyyāt/: [عربـی]/اسـم. فڕوفیـشاڵ؛ شتانی هەڵبەستراو.

**جغجغــه** / ceqceqe ، ـهـا/: اسـم. ۱. چغچغـــە؛ شەقشەقە؛ قوتووی لەیستۆک کە خڕەی دێـت ۲. زرزرە؛ خڕخاشە؛ خەرخەشە؛ لەیزتۆکێک بـە شێوازی گۆ یان قوتووی چکۆلەی دەسکدار کـە سـاچمەی تێدایـە، دەیلەرێننــەوە، زڕەی دێ ۳. هاچەرجغجغە؛ جۆرێک هاچەری وەک ئاچەر فەڕانسە.

**جغد** / coqd ، ـها؛ ـان/: اسم. بوو؛ بووە؛ بـۆ؛ بـووم؛ کونـد؛ کونـدەبوو؛ کوندەبوومــە؛ کوندەبــەبوو؛ پەپووکـــەرە؛ کەڵکەڵـــەوانی؛ خاڵــەکوکومە؛ کوندەبەبەبی؛ بووەکوێرە؛ بـاوەقوش؛ بایـەقوش؛ بادەقوش؛ باینە؛ توت؛ تژی؛ باڵندەیەکە بە شـەو دەردەکەوێ بە شووم بەناوبانگە.

▣ **جغد انبار:** کوندەزیڕە؛ جۆرێک کوندەبوو.

**جغد جنگلی:** کوندەقوتە؛ کوندی دارسان.

**جغـد مـاهیخـوار:** کونـدەڕۆماڵ؛ کونـدی ماسیخۆرە.

**جغد میمونرخ** ☜ **میمونرخ-۲**

**جغدمیمون** / coqdmeymûn/: [فارسـی/ عربـی] ☜ میمون شب، **میمون**

**جغرافـــی** / coqrāfî/: [معـــرب از یونـــانی] ☜ **جغرافیا**

**جغرافیا** / coqrāfiyā/: [معرب از یونـانی/ فرانـسوی]/اسم. جوگرافیا: ۱. زانستی لێکۆڵینەوەی زەویـن و ژیانی سـەر زەوی و ناسـاندنی زەریـا و کێـو، چۆم و دەشت، کەش و هەوا و پەرژ و بلاوی گیا و گیانەوەران و هەروەها مرۆڤ و کردوکۆشی لە بـــواری ئـــابووری و داهێنانـــەوە ۲. شکـــڵی جوگرافیایی ناوچەیەک ۳. کتێبێـک کـە باسـی جوگرافیا دەکات ٭ **جغرافی**

▣ **جغرافیـای اقتـصادی:** جوگرافیـای ئـابووری؛ جوغرافیای سـەبارەت بـە درووسـتکـردن و بەشینەوە و بەکارهێنانی داهات.

**جغرافیـــای انـــسانی:** جوگرافیـــای مرۆڤـــی؛ جوگرافیـــای پێوەندیـــدار بـــە پـــرژ و بـــلاوی کۆمەڵـگای ئینـسانی، دوزەنـەی ڕامیـاری و چالاکی ئابووری مرۆڤەوە.

**جغرافیای ریاضی:** جوگرافیای بیرکاری؛ بەشێ لە جۆگرافیـا کـە لـە بیچمـی گـۆی زەویـن، تایبەتمەندیەکانی و شێوەی کێشانی نەخشە دەکۆڵێتەوە.

**جغرافیـای زیـستی:** جوگرافیـای ژینـەوەری/

ژیان؛ جوگرافیای سەربە پێوەندی مرۆڤ و گیانەوەر و گیا، لەگەڵ ژینگەدا.
**جغرافیای طبیعی:** جوگرافیای خۆرسکی؛ جوگرافیای سروشتی؛ جوگرافیای پێوەندیدار بە تەشک و توێکڵی زەوی و دیمەنە سروشتیەکانی (وەک زەریا، گۆل، چۆم و کێو).
**جغرافیائی** / coqrāfiyā'î/: [معرب] ☜ **جغرافیای**
**جغرافیایی** / coqrāfiyāyî/: [معرب] *صفت.* جوگرافیایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە جوگرافیاوە ‹مرز جغرافیایی آسیا و اروپا: سنووری جوگرافیایی ئاسیا و ئوورووپا›: **جغرافیائی**
**جغرافیدان** / coqrāfîdān ، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی]/*اسم.* جوگرافیزان؛ کەسێ کە لە زانستی جوگرافیادا شارەزایە و پێوەی خەریکە.
**جغله** / ceqele/: *صفت. [تعریض]* تیسقل؛ تسقل؛ منداڵکار؛ زارۆکە ‹بچەی جغله: منداڵی تیسقل›.
**جغوربغور** / caqûrbaqûr/:/*اسم.* قاورمەی دڵ و جەرگ و گورچیلەی وردکراوی پەز یا گا کە بە دووگ سووری دەکەنەوە: **حسرت‌الملوک**
**جفا** / cafā ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ۱. *[ادبی]* ئازار؛ ستەم؛ گووج؛ بێداد؛ سزا ۲. *[قدیمی]* ناسزا؛ سەرکۆنە؛ جنێو.
▣ **جفا دیدن:** سزا دیتن؛ زۆر ستەم چەشتن.
هەروەها: **جفا شدن؛ جفا کردن**
**جفاپیشه** / cafāpîše ، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *صفت. [ادبی]* ستەمکار؛ دڵڕەق؛ هۆگری ئازاردانی خەڵک: **جفاجو؛ جفاکار**
**جفاجو** / cafācû/: [عربی/ فارسی] ☜ **جفاپیشه**
**جفاکار** / cafākār/: [عربی/ فارسی] ☜ **جفاپیشه**
**جفاکش** / cafākeš/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ئازارچەش؛ سزادیتوو؛ بەر زۆر و ناحەقی کەوتوو.
**جفت**[1] / coft ، ـها/:/*اسم.* جووت؛ جفت؛ جۆت: ۱. هیتێ؛ یەکەی هەژماردنی ئەوەی بە شێوەی دووبەدوو بەکاردەچێ. بەرانبەر: **لنگه** ‹یک جفت کفش: جووتێ کەوش› ۲. *[کشاورزی]* هیتە؛ دوو سەرگا کە بە دار و گاوەسنەوە دەبەسرێنەوە ۳. *[کنایی]* لف: *الف)* هاوسەر *ب)* نێر یان مێوینەی گیانەوەر ٤. جەخت؛ سەرکلاوی بەڕوو کە بۆ ڕەنگ‌کاری بەکاردەچێ ٥. *[زیست‌شناسی]* یاوەرە؛ ئاواڵ منداڵ؛ هەڤاڵۆک؛ هۆزی، جفت؛ کۆمەڵە ڕەگی هاوڕێی تۆل لە زگی دایکدا.
**جفت**[2]: *صفت.* جووت؛ جفت؛ جۆت: ۱. بەرامبەری تاک؛ دووانە ‹عدد جفت: ژمارەی جووت› ۲. لف؛ هاوتا؛ هاولف؛ هاوچەشن؛ هاوسان؛ هاوسەنگ ‹این گلدان جفت آن یکی است که پارسال خریدم: ئەم گوڵدانە لفی ئەوەیە پار ساندم›.
▣ **جفت کردن:** جووت/ جفت‌کردن؛ هەرکام لە دوو لفی هاوبەش لە لای یەک دانان ‹کفش‌ها را جفت کرد: کەوشەکانی جووت کرد›.
**جفت‌ـجفت** / coftcoft/: *قید.* جووت‌ـجووت؛ جۆت‌ـجۆت؛ دوان‌ـ دوان؛ بە شێوەی دوانی ‹صندلیها را جفت‌ـجفت کنار هم بچین: سەندەڵیەکان جووت‌ـجووت بچنە پاڵ یەک›.
**جفت‌سم** / coftsom ، ـان/:/*اسم.* جووت‌سم؛ جۆت‌سمە؛ خاوەن سمی دوانی یا چواری ‹جانور جفت‌سم: گیانەوەری جووت‌سم›.
**جفتک** / coftak/:/*اسم.* جووتە؛ جفتە: ۱. لووشک؛ لووشکە؛ جۆتلێ؛ جفتک؛ جوتکە؛ لێدانی بە جووتە پێ ‹چرا مثل خر جفتک می‌پرانی؟: بۆچی وەکوو کەر جووتە دەوەشێنی؟› ۲. باز؛ پەڕشت بە دوو پێیان ‹جفتک زدم و پریدم روی دیوار: بە جووتە پەڕیمە سەر دیوارەکە›.
▣ **جفتک پراندن/ انداختن:** جووتە وەشاندن؛ جفتە خستن؛ لووشک پەڕاندن؛ جۆتک هاویشتن؛ هەڵگووزان؛ هەڵتووزان؛ هەڵگووزانن؛ هەڵتۆزاندن؛ جۆتلێ شانەی: ۱. برک‌دانی هەر دوو پێیانی چارەوا بەرەو کەسێ یان شتێ ۲. *[تعریض، گفتاری]* لەقە

وەشاندن؛ بە شێوەیەکی نەگونجاو بەرهەڵست بوون.

**جفتک زدن**: ۱. ☜ **جفتک پراندن/ انداختن** ۲. هەڵخستنەوە؛ جفتەک داین؛ هۆروسەیوە؛ هەر دوو پێ بەیەکەوە کوتانە زەویندا بۆ باز بردن.

**جفتک‌پرانی** / coftakparānî ، ـها/: اسم. جووتەوەشێنی؛ لەقەهاوێژی.

**جفتک‌چارکش** / coftakčārkoš/: اسم. کەوشەک؛ سێباز؛ یارییەکی بە کۆمەڵە لە شوێنێکی بەربلاودا بەڕێوەدەچێ، کەسێ دادێتەوە و دەس بە ئەژنۆیەوە دەگرێ و دیتران بە سەریدا باز دەدەن: **پشتک‌چارکش**

**جفتگیری** / coftgîrî ، ـها/: اسم. خەرز؛ جووتگری؛ لفگری؛ جووتبوونی گیانەوەری نێر لەگەڵ مێدا.

**جفت و جزم** / coft-o-cazm/: [فارسی/ عربی] صفت. [گفتاری] سفت‌وسۆڵ؛ تۆلا؛ توندوتۆڵ؛ چەسپاو بە یەکەوە؛ پتەو و پێکەوە لکاو. هەروەها: **جفت‌وجزم شدن؛ جفت‌وجزم کردن**

**جفت وجلا** / coft-o-calā/: [فارسی/ عربی] ☜ **جفت‌وجور**

**جفت‌وجور** / coft-o-cûr/: صفت. [گفتاری] جفت‌وجۆر؛ هاولف و تەبا لەگەڵ یەکتر: **جفت‌وجلا**

**جفتی**[1] / coftî/: صفت. [گفتاری] جووتی؛ جۆتیێ؛ بە جووت؛ دوانی ‹گره جفتی: گرێی جووتی›.

**جفتی**[2]: قید. ۱. بەجووت؛ جووتە؛ جووتی؛ جۆت؛ دوانی ‹زن و شوهر، جفتی وارد شدند: ژن و شووەکە بەجووت هاتنە ژوورەوە› ۲. جووتێ؛ جفتێ؛ جووتێک؛ هیتێو؛ هەر جووت ‹جفتی ۱۰۰۰ تومان: جووتێ ۱۰۰۰ تمەن›.

**جفت‌یابی** / coftyābî ، ـها/: اسم. [زیست‌شناسی] لفگری؛ جووتگری؛ کار یان ڕەوتی کردوکۆش، دانە پەی و ڕاکێشانی لف بۆ جووتبوون.

**جفنگ** / cafang/: صفت. [گفتاری] قۆڕ؛ بێ‌هۆ؛ بێهوودە؛ چونە؛ پووچ؛ پویچ؛ جەفەنگ؛ گەزاف؛ سووک و بێ‌بایەخ ‹حرف جفنگ: قسەی قۆڕ›.

▣ **جفنگ گفتن**: گەزاف گوتن؛ وڕاوەکردن/ وتن؛ وڕینەکردن؛ قسەی قۆڕکردن؛ قسەی هیچ و پووچ کردن.

**جفنگیات** / cafangîyyāt/: (!) [فارسی/ عربی] اسم. [گفتاری] قۆڕیات؛ فڵتەفڵت؛ قسەی مفت؛ قسەی بێ‌پایە؛ قسەی قۆڕ؛ لافوگەزاف.

**جقه** / ceqqe ، ـها/: [ترکی] اسم. خشڵێ لە شێوەی گوڵ، خۆر یان مانگ بۆ ڕازاندنەوەی بەرەوەی کڵاو و کولیلک.

**جک** / cak ، ـها/: [انگلیسی] اسم. جەک؛ هەڵێن؛ ئامرازێکە بۆ بەرزکردنەوەی شتگەلی قورس تا بەرزاییێکی کەم ‹توی آن سرما مجبور شدیم جک زیر ماشین بزنیم و زنجیر ببندیم: لەو سەرما و سۆڵەدا ناچار بووین جەک بدەینە ژێر ماشین و زنجیر ببەستین›.

**جک‌وجانور** / cak-o-cānevar, -cānavar/: اسم. [گفتاری] جڕ و جانەوەر؛ گیانەوەرەی جۆربەجۆر، بەتایبەت زیندەواری گەزندە.

**جکوزی** / cakûzî/: [انگلیسی] اسم. جەکووزی؛ ناوی بازرگانی جۆرە وانێکی حەمامە کە بە پژاندنی بە تەوژمی ئاو و با، گێژاو پێک‌دێنێ ماسوولکەی لەش ئەشێلێ: **جاکوزی**

**جگر** / cegar/: اسم. جگەر؛ جەرگ؛ جەگەر؛ جیەر؛ جەری: ۱. یەهەر؛ یەهر؛ مەلاک؛ مەلاک؛ کەزەب؛ قەزەب؛ ئەندامێ لە لەشی گیانەوەرانی مۆرەداردا کە زەرداو دەردەدا و لە گۆڕینی پێکهاتەگەلی خوێندا، دەورێکی گرینگی هەیە ۲. خۆراکی لە جگەر ‹جگر مرغ: جەرگی مریشک› ۳. [گفتاری] دڵ‌وجەرگ؛ جەرگ‌ودڵ؛ گیانی‌گیان؛ کەسی زۆر خۆشەویست ٤. [مجازی] زات؛ بوێری ‹جگر این کار را نداری: جەرگی ئەم کارەت بکەی›.

▣ **جگر زلیخا:** *[مجازی]* پەڕۆی دۆم؛ لەت ـ لـەت؛ ئەنجن ـ ئەنجن؛ شڕ و وڕ ‹پیراهنم شده بود عـین جگر زلیخا: کراسەکەم ببووە پەڕۆی دۆمەوە›.
**جگر سفید:** سی؛ سپیەلاک؛ شۆشی؛ ئەنـدامی هەناسە دانی زیندەوەرانی وشکی.
**جگر سیاه:** جەرگ؛ جگەر؛ یەهەر؛ مێلاک.
▣ **جگـر بـرای چیـزی لـک زدن:** *[مجـازی]* بـۆ شـتێک فـەرقان کـردن/ دڵ دەرهـاتن/ پـەڕ دەرکـردن/ سـوێی هاتنـەوە؛ کلکـە پـەی چێوێوی کرۆتەی؛ گەلەک خوازیـاری شـتێک بوون ‹جگرم برای یـک لیـوان آب خنـک لـک زده: دڵم بۆ لیوانێ ئاوی سارد دەرهات›.
**جگــر را جــلا دادن:** *[مجــازی]* گیــان تــێ خستنەوە؛ تینوویەتی لابـردن و بوونـە هـۆی بووژانــەوە ‹ایـن شـربت جگـرم را جـلا داد: ئـەم شەربەتە گیانی تێخستمەوە›.
**جگـر شـیر داشـتن:** *[مجـازی]* چنگـی پـڵنگ شکاندن؛ بوێر و ئازا بوون ‹راستی کە جگـر شـیر داری: بە ڕاستی چنگی پڵنگ دەشکێنی›.
**جگر کاری را داشتن:** *[مجازی]* زاقـری کارێـک هەبوون؛ بۆ ئەنجامدانی کارێ بەزات بوون ‹تو جگر در افتادن با او را نداری: تۆ زاقرت نیە بەگژیـدا بچی›.
**جگر کسی آتش گرفتن:** *[مجازی]* کزە لـە دڵـی کەسـێکەوە هەسـتان؛ خـەمی زۆر خـواردن؛ یەکجار جخارین بوون ‹از این حادثە جگرم آتـش گرفت: لەم ڕووداوە کزەم لە دڵەوە هات›.
**جگر کسی را خون کـردن:** *[مجـازی]* جـەرگی کەسێ دانـە تـەنوورەوە؛ کەسـێک گیانەسـەر کردن؛ ڕەنج و خەفەتی زۆر بە کەسێ دان ‹با این کارهایـت جگـر مـادرت را خـون کـردەای: بـەم کارانـەت جـەرگی دایکـت داوە بـە تـەنوورەوە›. هەروەها: **جگر کسی خون شدن**
**جگر کسی را سرمە کـردن:** *[مجـازی]* ئـاور نانـە جەرگ کەسێکەوە؛ کەسێ جەرگاوس کـردن؛ کەسێ زۆر خەفـەتبارکردن ‹ایـن کـودک نابینـا جگرم را سرمە کرد: ئەم منداڵە کوێرە ئـاوری نایـە جەرگمەوە›.
**جگـر کـسی کبـاب شـدن:** *[مجـازی]* جـەرگی کەسێ لەت ـ لەت/ کەباب بوون/ برژان؛ جگەر کەسی سزیان؛ خـەمی زۆر بـە سـەردا هـاتن ‹جگرم برایش کباب شد: جەرگم بۆی لـەت ـ لـەت بوو›. هەروەها: **جگر کسی را کباب کردن**
**جگربند** / cegarband/: *اسم.* سی و جـەرگ؛ دڵ و جەرگ و سی پێکەوە.
**جگرپارە** / cegarpāre/ ☜ **جگرگوشە**
**جگرخـــراش** / cegarxarāš/: *صـفت. [مجـازی]* جەرگبڕ؛ دڵتەزێن؛ جەرگخۆرە؛ زۆر ناخۆش و خـەمهێن ‹واقعـەی جگرخراشـی بـود: کارەسـاتێکی جەرگبر بوو›: **جگرسوز**
**جگرخوار** / cegarxār/: *صفت. [کنایی]* دڕنـدە؛ بێڕەحم؛ دڵڕەق.
**جگرخـــون** / cegarxûn/: *صــفت. [مجــازی]* دڵبریندار؛ دڵخوێن؛ جەرگلەت؛ دڵپڕ لە ژان؛ زۆر خەفەتبار ‹از دست قوم و خویشها جگرخون است: لە دەس خزم و کەس دڵبریندارە›: **خونجگر**
**جگردار** / cegardār/: *صفت. [کنایی]* بەجـەرگ؛ جەرگ قایم؛ نەترس؛ بوێر؛ بێباک؛ دلێر.
**جگرسوز** / cegarsûz/ ☜ **جگرخراش**
**جگـــرک** / cegarak/: *اسـم. [گفتـاری]* کـەواوی جەرگی ئاژەڵ.
**جگرکـــی** / cegarakî ، ـهـا/: *اسـم. [گفتـاری]* جگەری؛ جگەرچی؛ فرۆشەری کەواوی جەرگ و دڵ.
**جگرگوشە** / cegargûše ، ـها؛ ـگان/: *اسم. [مجازی]* بەنەندڵ؛ بەنی دڵ؛ بەندی جەرگ؛ بەنجگـەر؛ گوجـەدڵ؛ کەسـی زۆر خۆشەویـست بەتایبـەت زارۆک: **جگرپارە**
**جگـری**[1] / cegarî/: *اسـم.* ١. جگـەری؛ ڕەنگـی سووری نێزیـک بـە قـاوەیی خەسـت ٢. ـهـا/

جگەری؛ جگەرچی؛ فرۆشیاری جگەر (و دڵ و سی و گورچیلە)ی ئاژەڵان.

**جگری**[2]: صفت. جگەری: ١. پێوەندیدار بە جگەرەوە ٢. بەڕەنگی جگەر.

**جگن** / cagan ، ـها/: اسم. جەگەن؛ ناردین؛ لەبان؛ سێ‌سووە؛ سێ‌سۆ؛ گیایەکی لاسک سێ سووچ و گەلا چەتری کە لە زەلکاوان دەڕوێ.

**جگوار** / cagvār ، ـها؛ ـان/: [انگلیسی از پرتغالی] /اسم. جاگوار؛ گیانەوەرێکی گوهاندەری گۆشتخۆرە لە تیرەی پلەنگ، سەر بە دەڤەری گەرمیانی ئامریکا، لە پلنگ گەورەتر و ڕەنگی پێستی قاوەیی کاڵە.

**جل** / col ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. جل؛ پۆشەنی سەر پشتی چارپێیان ‹جل اسب: جلی ئەسپ› ٢. /کنایی/ شڕە؛ شەنگەشڕە؛ جلەشڕە؛ بەرگی چەرمسی ‹نمی‌خواهی این جل را از تنت در بیاوری: ناتەوێ ئەم شڕەیەت لە بەر داکەنی›.

▣ **جل خود را از آب بیرون کشیدن**: /کنایی/ بەڕ خۆ لە ئاوگرتنەوە؛ تا ڕادەیەک کاری خۆ بردنە پێشەوە.

**جلا** / calā /: [عربی]/اسم. ١. /ـها/ بریقە؛ بریقە؛ بریکە؛ وریچە؛ ورشە؛ گرشە؛ ورچە ‹جلای فلزی: بریقەی کانزایی› ٢. هەڵوەدایی؛ ئاوارەیی؛ پەرتەوازەیی؛ بەرەزەیی ‹جلای وطن: هەڵوەدایی نیشتمان›.

▣ **جلای وطن**: هەڵوەدایی نیشتمان؛ ئاوارەیی لە زێد و نیشتمانی خۆ؛ تەرکی زێد و نیشتمان.

▣ **جلا دادن**: بریقە لێ‌هێنان/ لێ‌خستن.

**جلاب** / collāb /: [معرب از فارسی]/اسم. /قدیمی/ شەربەت گولاو؛ خواردنەوەیەک بریتی لە ئاو، گولاو، زەعفەران و شەکر.

**جلاد**[1] / callād ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. /قدیمی/ دژخێم؛ جەلاد؛ جەللاد؛ میرخەزەب؛ میرغەزەب؛ سەربڕ؛ سەرکەن؛ کەسێ کە فەرمانی ئەشکەنجەکردن، کوشتن و لە سێدارەدانی تاوانبارانی بەڕێوە دەبرد.

**جلاد**[2]: صفت. /کنایی/ ستەمکار؛ دڵڕەق.

**جلادت** / calādat /: [عربی]/اسم. /ادبی/ ١. تۆڵی؛ زبتی؛ فرزی؛ چەلەنگی؛ چابکی ٢. /کنایی/ پاڵەوانی؛ زۆرداری.

**جلال** / calāl /: [عربی]/اسم. ١. شکۆ؛ شکۆمەندی؛ تەنتەنە؛ بزەم-بزەم؛ سەنسەنە؛ ژاژ و فەڕ ٢. مەزناهی؛ گەورەیی.

**جلالت** / calālat /: [عربی]/اسم. شکۆ؛ پایەبەرزی؛ فەڕ؛ مەزناهی.

**جلالتمآب** / calālatma'āb /: [عربی] صفت. /قدیمی/ شکۆمەند؛ گەورە؛ مازن.

**جل‌الخالق** / callalxāleq /: [عربی] دعا. سوبحانەڵڵا؛ لە سەرسوورمان و حەپەساندا دەیڵێن (یانێ: خودا چەند گەورەیە).

**جلب**[1] / calab /: [عربی] ☜ **ژالاب**

**جلب**[2] / ـها/: صفت. ١. حیز؛ حیزە؛ جندە؛ جننێ؛ گوزلی؛ ژنی خراپ ٢. فێڵباز؛ گزیکار؛ جەڵەب؛ چاچۆڵباز؛ گەڕباز.

**جلب** / calb /: [عربی]/اسم. ١. ڕاکێش؛ ڕاکێشانی سەرنج یان هۆگرەتی بە شتێ یان کەسێ ‹چیزی در پای دیوار توجهش را جلب کرد: شتێ لە بن دیوارەکە سەرنجی ڕاکیشا› ٢. قۆڵبەست؛ باڵبەس ‹پلیس دزد را جلب کرد: پولیس دزەکەی قۆڵبەست کرد› ٣. /گفتاری/ ڕاکێش؛ کار یان ڕەوتی ڕاکێشان و وەخۆ گرتن ‹آهنربا آهن را به طرف خود جلب می‌کند: هەسنفرێن، ئاسن بەرەو لای خۆ ڕادەکێشێ›. هەروەها: **جلب شدن؛ جلب کردن**

▣ **جلب توجه**: سەرنج‌ڕاکێشی؛ کار یان ڕەوتی سەرنج ڕاکێشان ‹موی سرش جلب توجه می‌کند: قژی سەرنج ڕادەکێشێ›.

**جلبک** / colbak /: [عربی/ فارسی]/اسم. جلشین؛ کەفزە؛ کەفزەر؛ کەفز؛ کەڤز؛ کەز؛ کەژەوە؛ کەژاو؛ قەوزە؛ قەبزە؛ قەوزەقوڕواق؛ قۆزەقوڕواق؛ گیوقوڕواق؛ جلەشڕە؛ لمر؛ لیمقورماق؛

جل‌قـوروواق؛ کـەزی؛ گـاوەک؛ خـوری پەچنـە؛ کـەوگی؛ جـەلاوی؛ گـاوک: ۱. تیرەیـەک لـە ڕووەکگـەلی سـادەی ئـاوژی ۲. /ـهـا/ هـەموو جۆرێکی ئەم ڕووەکە، کـە خۆڵەمێـشی بـڕێکیان سەرچاوەی یۆد و پوتاسیۆمە.

**جلبک‌شناسی** / colbakšenāsî/: [عربی/ فارسی] *اسم*. کەفزەناسی؛ لقێ لە زانـستی گیاناسـی کـە دەپەرژێتە سەر ناسین، لێکۆڵینەوە و ڕیزبەنـدی قەوزەگەل. هەروەها: **جلبک‌شناس**

**جلت**[1] / collat ، ـها/: *اسم*. مادە؛ مـادێ؛ ڕفێـدە؛ دۆشەکڵەی نان بە تەندوورەوە دان: **نان‌بند**

**جلـت**[2]: *صـفت. [گفتـاری]* زرک و زینـگ؛ تـۆڵ؛ سەگ؛ قولاوباز؛ فێڵزان.

**جلـد** / cald/: [عربـی] *صـفت*. چـالاک؛ چابـک؛ چاپک؛ چوست؛ چەلەنگ؛ زرنـگ؛ فـرز؛ زرک و زیت؛ گورج و گۆڵ؛ کەلەش؛ تاشک.

**جلد** / celd ، ـها/: [عربی]*اسم*. ۱. بـەرگ؛ قـولاخ؛ ڕووکێشی کتێو، گۆڤار، پەڕاو و وەک ئەوانـە کـە ئەستوور و پتەوە و پەڕەگەلی ناوەوە دادەپۆشـێ ۲. بەرگ؛ یەکەی هەژماردنی کتێب و گۆڤار ‹ده جلد کتاب: دە بەرگ کتێـب› ۳. بـەرگ؛ پۆشـشی نەرمۆکـەی بـڕێ شـت ‹جلـد دوربـین: بـەرگی دووربین› ٤. بنکلێش؛ پێست؛ پۆس ‹شیطان توی جلـدش رفتـه بـود: شـەیتان چبـووە بنکلێـشیەوە› ٥. *[زیست‌شناسی]* ژێر پێست.

▣ **جلـد چرمـی**: بـەرگی چـەرمی؛ بـەرگی چەرمینی کتێو. هەروەها: **جلد سلوفان**

**جلد زرکوب**: بەرگی زێڕنووس؛ بـەرگێک کـە نووساوەکانی بە کانزایەکی بریقەدار (وەک زێڕ، زیو یان ئەکلیل) نەخش‌کراوە: **جلد ضربی؛ جلد طلاکوب**

**جلـد سـخت**: بـەرگی سـەخت/ ڕەق/ سـفت؛ گالینگۆر. بەرانبەر: **جلد نرم**

**جلد سفید**: بـەرگی سـپی؛ بـەرگێ کـە هـیچ نەخش و نیگارێکی لە سەر نەبێ.

**جلد شمیز** ☜ **جلد مقوایی**

**جلد ضربی** ☜ **جلد زرکوب**

**جلد طلاکوب** ☜ **جلد زرکوب**

**جلد گالینگور**: بەرگی سەخت؛ گالینگۆر.

**جلد معرق**: جۆرە بەرگێکی جوانکاریە کـە لـە پێکـەوە لکانـدنی لەتـە چـەرم و ڕەنـگ و نەخشی جوان دروست دەکرێ.

**جلد مقوایی**: بەرگی مقەبایی: **جلد شُمیز**

**جلد نـرم**: بـەرگی نـەرم؛ بـەرگی لـە جنـسی مقەوای نەرم. بەرانبەر: **جلد سخت**

**پشت جلد** ☜ **پشت**[1]

**توی جلد** ☜ **تو**[1]

**روی جلد** ☜ **رو**[1]

▣ **جلد ساختن**: بەرگ دروست‌کردن: ۱. بـڕینی چەرم و مقەبا و دالکاندن و لە کتێب گرتنیان ۲. دابین‌کردنی نووسراوە و جار-جار نەخش و نیگاری سەر بەرگ.

**جلد کردن**: لە بەرگ‌گرتن؛ جلدگرتن.

**توی/ در جلد کسی رفتن**: *[مجـازی]* ۱. چوونـە پێستی کەسێکەوە؛ خـۆ بـە شـێوە و بیچمـی کەسـێ دەرهێنـان ۲. چوونـە بنکـلێش/ بنکلێـشەی کەسـێکەوە؛ کەسـێ گرتنـە دەسەوە؛ کەسێک بە ئارەزووی خۆ لێ‌کـردن؛ هـزر و بـیر و هەسـتی کەسـێک گرتنـە دەستەوە.

**جلدی**[1] / caldî/: [عربی]*اسم*. ئـازایی؛ زرنگـی؛ چـالاکی؛ فـرزی؛ کـرژی؛ گـورجی؛ خێرایـی؛ چاپکی؛ چەلەنگی.

**جلدی**[2]: *قید. [گفتاری]* ئـازا؛ خێـرا؛ کـرژ؛ گـورج؛ گورج‌وگۆڵ؛ فرزێ؛ زووبەزوو؛ بـە تونـد و تیـژی ‹جلدی بـرو ایـن دوا را بگیـر و برگـرد!: ئـازا بـڕۆ ئـەم دەرمانە وەرگرە و بێرەوە!›.

**جلدی**[1] / celdî/: [عربی] *صفت. [پزشکی]* پێستی؛ پۆسی ‹بیماری جلدی: نەخۆشینی پێستی›.

**جلدی**[2]: *قیـد*. بەرگێ؛ هەر بـەرگ ‹کتابهـا جلـدی

۲۰۰ تومان سود دارد: کتێبەکان بەرگی ۲۰۰ تمەن قازانجیان هەیە›.

**جلـز و ولـز / celez(z)-o-velez/:** صـوت. ۱. قرچەقرچ؛ چـز و بـز؛ چزەچز؛ جزەجز؛ جیزجاز؛ کزەکز؛ دەنگی سووڕەوە بـوون یـان برژانی شتێ (بە تایبەت گۆشت) بە سەر ئـاگرەوە ۲. *[مجازی]* هاوار و ناڵە؛ ناڵەناڵ.

**جلسات / calasāt, calesāt/:** [عربی] جمعِ ☜ **جلسه**

**جلسه / calase, cal(e)se،** ـها؛ جلسات/: [عربی] *اسم.* کـۆڕ؛ دانیـشتن: ۱. کۆڕگـە؛ شـوێنێ کـە دەستەیەک بۆ وتوویژ لەمەڕ بابەتێکەوە تێیدا کۆ دەبنەوە (و زۆرتر دادەنیشن) ۲. کـۆ بوونـەوە؛ بەراقی؛ جوات؛ جڤات؛ گور؛ گهان؛ کۆمبوونەوە و دانیشتن بۆ ئاوەها مەبەستێ.

▣ **جلسەی خصوصی:** دانیـشتنی نـاوخۆیی؛ دانیشتنێک کە بڕیارەکانی ڕاناگەیەندرێت.

**جلسەی سرّی:** دانیشتنی نهێنی؛ دانیشتنێ کە بە شێوەی نهێنی و بێ ئاگای خەڵکە.

**جلسەی علنی:** دانیشتنی ڕاشـکاو/ ئاشـکرایی؛ دانیشتنێ کە هەموان بتوانن لـە پێکهێنـان و قسە و باسی خەبەریان هەبێ.

▣ **جلسە داشتن:** دانیـشتن/ کـۆڕ هـەبوون؛ لـە کۆڕدا بەشـدار بـوون ‹آقـای رئیس جلسە دارد: ئاغەی ڕەئیس دانیشتنی هەیە›.

**جلسە کـردن:** کـۆ بوونـەوە؛ دانیـشتن؛ کـۆڕ پێکهێنان ‹رفقا جلسە کردنـد و تـصمیم گرفتنـد اعلامیـە را منتـشر کننـد: هەڤـالان کۆبوونـەوە و بڕیاریان دا ئاگاداریەکە بلاو بکەنەوە›.

**جلف / celf/:** [عربی] *صفت.* جلف؛ سووک؛ قرت؛ سووک و چرووک؛ قڕ؛ قروفڕ: ۱. بەربەفش؛ بلَح؛ هـەرزەکارێ کـە وازی لـە دەسـبازی و خـۆ دە خەڵـک هەڵـسوونە ‹آدم جلـف: مرۆڤـی سـووک› ۲. دزێو؛ ناشـیرین و نالـەبار ‹لباس جلـف: جلی جلف›.

**جلفی / celfî/:** [عربی] *اسم.* جـلفی؛ جـلفیەتی؛ سووکی؛ سۆکی ‹این کـار جلفـی اسـت: ئـەم کـارە جلفیە›.

**جلق / calq/:** [عربی] *اسم.* جلّق؛ مـشتە؛ مـشتاو؛ دەسـپەڕ؛ دەسـتپەڕ؛ دەسـتمێز؛ دەسـتمیز؛ کەپلەمە؛ دەستگان؛ بزواندنی ئەندامی جینـسی لە لایەن خودی کەسەوە بۆ گەیشتن بە خۆشی جینسی، بە بێ جووتبوون.

▣ **جلق زدن:** جلّق لێدان؛ مشتەکـردن؛ مـشتاو کردن؛ دەسپەڕکردن؛ کەپڵەمە کێشان.

**جلقاب / colqāb/:** [عربی/ ترکی] *اسم. [گفتاری]* قاپ دەسماڵ؛ جێ دەسرە.

**جلقو / colqû،** ـها/: [؟] *اسم.* پین؛ پیم؛ بزمار یان میلەیەک کە لە تەوەرەی چەرخی دەکەن، لێک جوێ نەبنەوە.

**جلگـه / colge،** ـها/: *اسم.* دەشـت؛ دەشـتایی؛ قەلاچ؛ قەراج؛ کرک؛ گەڕ؛ سفتیک؛ دەشتی نزم و تەخت.

▣ **جلگەی آبرفتی:** دەشتی تمتمـان؛ سـفتیکی گیرهەیی؛ تەختانێک کە بـە هـۆی ئاوەماڵـی ڕۆبارانەوە پێکهاتووە.

**جلگەی سیلابی:** دەشتی لاخێزە؛ دەشتی بـەر لافاو؛ گۆڕەپانێک کە بە هۆی هاتنە سەرەوەی ئاوی چۆمان و هەستانی لافاو، لە لێوارەکانیدا پێکهاتبێ: **جلگەی کنارەای**

**جلگەی کنارەای** ☜ **جلگەی سیلابی**

**جلگـەای / colge'î/:** *اسم.* دەشـتی؛ قـەلاچی؛ قەراجی؛ سفتیکی: ۱. پێوەندیدار یان سـەر بـە دەشـتەوە ‹آب و هـوای جلگـەای: کـەش و هـەوای دەشـتی› ۲. بە دۆخ یـان چۆنیـەتی قەلاچیـەوە ‹زمینهای جلگەای: زەوینگەلی سفتیکی›.

**جلنبـر / colombor،** ـهـا/: *صفت.* شـڕەبار؛ شـڕپۆش؛ سیپالـپۆش؛ شـڕ و شـەپڕێو؛ شڕەوپڕەپۆش.

**جلـو**[1] **/ celow, colow, celo:, colo:،** ـها/:

[ترکی]*اسم. [گفتاری]* ۱. بەردەم؛ وەردەم؛ بەر؛ وەر؛ پێش؛ نوا؛ سینگە. بەرانبەر: **عقب** ‹جلوت را نگاه کن!: چاوت لە بەردەمت بێ!› ۲. بەر؛ وەر؛ پێش؛ نوا؛ سینگە؛ بەشێ کە نزیکتر لە بەشێکی ترە و لە پێشیدایە ‹جلو در: بەر دەرکە› ۳. هەوسار؛ لەغاو؛ لغاف؛ جڵەو.

■ **جلو چشم کسی را خون گرفتن** ☜ خون جلو چشم کسی را گرفتن، **خون**

**جلو خود را گرفتن:** بەر خۆگرتن؛ خۆ پاراستن ‹خواستم بزنم توی گوشش، ولی جلوی خودم را گرفتم: گەرەکم بوو بسرەوێنمە بن گوێیدا، بەڵام بەر خۆمم گرت›. هەروەها: **جلو خود را نگهداشتن**

**جلو کسی را گرفتن:** بەر کەسێ گرتن؛ کەسێ لەو کارەی کە دەیکا، یان دەیەوێ بیکا، پریگاندنەوە؛ بەر پێ گرتن ‹جلو پسرت را بگیر! دارد خانه را آتش می‌زند: بەر کوڕەکەت بگرە! خەریکە ماڵەکە ئاگر بدات›.

**جلو کسی را ول کردن:** چاو لە کەسێ داخستن؛ بەر بۆ کەسێ بەردان؛ پێش کەسێ نەگرتن؛ چاوەدێری کەسێ نەکردن.

**از جلو کسی درآمدن:** چوونە ڕووی کەسێکدا؛ بەرهەڵستی ئاکاری ناڕەوای کەسێک بوون.

**جلو**[۲]: *صفت.* ۱. بەروو؛ پێشوو؛ نوا؛ نوها؛ پێشەوە ‹درِ جلو: درگای بەروو› ۲. *[مجازی]* پێش؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی سەرتر بوون لە دیتران.

■ **جلو بودن:** لە پێشەوە بوون؛ لە بەرەوە بوون.

**جلو**[۳]: *قید.* بەر؛ وەر ‹جلو در: بەر دەرگا›.

▣ **جلو قاضی و معلق‌بازی:** مزگەوت و جرت؛ ئاکاری نەشیاو و نەگونجاو.

■ **جلو آمدن:** ۱. هاتنە بەرەوە؛ بەرەو پێش هاتن؛ بەرەو پێشەوە هاتن؛ ئامەی وەڵێوە ‹دو قدم جلو بیا: دوو هەنگاو بێرە بەرەوە› ۲. هاتنە پێشەوە؛ هاتنە بەرەوە ‹ساختمان نیم متر توی پیادەرو جلو آمدە بود: خانووەکە نیو میتر لە پیادەڕەوەکە هاتبووە پێشەوە› ۳. کەوتنە بەرەوە؛ پێشڕەوت کردن ‹مدتی با هم کار کردیم درسش جلو آمد: ماوەیەک پێکەوە کارمان کرد دەرسەکەی کەوتە بەرەوە›.

**جلو افتادن:** کەوتنە پێشەوە؛ پێشکەوتن: ۱. کەوتنە بەر؛ لە چاو کەسێ یان شتێکی تر لە پێشەوە بوون ‹آزاد خیلی زود از همەی ما جلو افتاد: ئازاد زۆر زوو کەوتە پێش هەموومانەوە›: **جلو زدن** ۲. وەپێش کەوتن؛ کەوتنە بەر؛ کەوتەی وەڵێ ‹پدرم جلو افتاد و ماهم دنبالش: باوکم کەوتە بەر و ئێمەش بە دوویدا› ۳. *[مجازی]* دەس دانەبەر؛ وە پێش کەوتن.

**جلو انداختن:** خستنە بەرەوە: ۱. دانەبەر؛ خستنە پێشەوە؛ وەبەر خستن ‹گوسفند را جلو انداخت و با خود برد: مەڕەکەی دایە بەر و لەگەڵ خۆیدا بردی› ۲. *[مجازی]* خستنە پێشەوە؛ بوونە هۆی خێرایی یان پێشکەوتن ‹فروش رفتن خانە کارمان را جلو انداخت: فرۆشرانی ماڵەکە کارمانی خستە بەرەوە› ۳. کورت کردنەوەی ماوەی کارێک ‹کار مرا جلو بینداز: کارەکەی من بخە بەرەوە›.

**جلو توپچی ترقە درکردن:** *[کنایی]* درۆ بە لای هاوشاریەوکردن؛ کاری گۆترە و بێهۆ کردن: **جلو لوطی پشتک زدن**

**جلو رفتن:** چوونە پێشەوە؛ چوونە بەرەوە؛ لوای وەرەوە؛ ئەونوا چوون؛ وەرەوە لوەی.

**جلو زدن** ☜ **جلو افتادن ـ ۱**

**جلو کسی/ چیزی ایستادن:** ۱. لە بەر کەسێک/ شتێکەوە ڕاوەستان؛ لە بەرانبەر کەسێکەوە وەستان ‹ایستاد جلوی پنجرە: لە بەر دەلاقەکە ڕاوەستا› ۲. لە بەرانبەر کەسێ/ شتێکەوە وەستان/ وێسیانەوە/ باشاری کردن ‹جلو دشمن ایستاد: لە بەرانبەر دوژمنەوە وەستا›.

**جلو کسی درآمدن:** ۱. بەر بە کەسێ گرتن؛ لە بەرانبەریەوە دەرکەوتن ‹از پسکوچەها رفتم و سر

چهارراه جلوش درآمدم: بە کۆلانە تەنگەکانا چووم و لە سەر چوارڕێیانەوە بەرەم پێ گرت› ۲. *[مجازی]* لە بەرانبەر کەسێکەوە وێستانەوە؛ ڕاسبوونەوە.

**جلو کسی دکان باز کردن:** *[کنایی]* لەگەڵ کەسێکدا دژبەرایەتی کردن.

**جلو لوطی پشتک زدن** ☜ **جلو توپچی ترقە درکردن**

**جلو نوبەای/ تبدار خربزە خوردن:** *[کنایی]* کەسێک خستنە سەر هەتەر؛ لای کەسێک کارێ کردن کە بیخاتە فەرتەنەوە.

**جلوئی** / celo'î, colo'î/: [ترکی] ☜ **جلویی**

**جلوباز** / celowbāz, colow-, celo:-/: [ترکی/ فارسی] *صفت.* بەرباز؛ بەرتاک؛ وەرواز: ۱. دەمتاک؛ لە پێشەوە ئاواڵە ‹کفش جلوباز: کەوشی بەرباز› ۲. جلکێ کە لە پێشەوە بکرێتەوە. بەرانبەر: **جلوبستە** ‹پیراهن جلوباز: کراسی بەرتاک›.

**جلوبستە** / celowbaste, colow-, celo:-/: [ترکی/ فارسی] *صفت.* بەربەسراو؛ بەربەسیاگ: ۱. بە بێ ئاواڵەیی لە پێشەوە ‹کفش جلوبستە: کەوشی بەربەسراو› ۲. بە بێ دوگمە یان زیپی بەرەوە. بەرانبەر: **جلوباز** ‹پیراهن جلوبستە: کراسی بەربەسراو›.

**جلوبند** / celowband, colow-, celo:-/، ـها/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* جلەوبەندساز؛ وەستاکارێ کە جلەوبەندی ماشێن دروست دەکاتەوە.

**جلوبندی** / celowbandî, colow-, celo:-/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* جلەوبەندی؛ بەشێ لە ماشێن بریتی لە جابەفەرمان و سەگدەس و ئەکسێل.

**جل وپلاس** / col-o-palās/: [عربی/ فارسی] *اسم.* *[تعریض]* کەلوپەل؛ کەلپەل؛ شڕ و شاتاڵی نێو ماڵ، بەتایبەت ژێرخەر و جلوجێوان.

⊡ **جل و پلاس خود را پهن کردن:** *[کنایی]* کەلپۆسی خۆ بە عەرزێدا دان؛ بەرە شرەی خۆ ڕاخستن؛ (خۆ) داکوتان؛ جێ لێ خۆش کردن؛ نیشتەجێ بوون؛ دامەزران ‹آمد و جل و پلاس خودش را در خانەی ما پهن کرد: هات و کەلپۆسەکەی لە ماڵی ئێمەدا بە ئەرزدا دا›.

**جل و پلاس خود را جمع کردن:** *[کنایی]* بارگە و بنە پێکەوەنان؛ بەرە شرەی خۆ کۆ کردنەوە؛ شەنگەشرە جەمکردنەوە؛ بار و بنە پێچانەوە؛ بە مەبەستی جێهێشتنی جێگایەک، کەلوپەلی خۆ کۆکردنەوە ‹دیروز جل و پلاسش را جمع کرد و رفت: دوێنێ بارگە و بنەی پێکەوەنا و چوو›.

**جل و پلاس کسی را بیرون ریختن:** *[کنایی]* شرە و برەی کەسێ خستنە دەرەوە ‹اگر تا آخر این هفتە اجارە را ندهی جل و پلاست را می‌ریزم بیرون: ئەگەر تا ئاخر ئەم حەوتەیە کرێکەت نەدەی شر و برەکەت دەخەمە دەرەوە›.

**جلوت** / calvat/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* ڕاشکاوی؛ ئاشکرایی؛ ئاشکاری؛ دیاری. بەرانبەر: **خلوت**

**جلوـجلو** / celowcelow, colowcolow, celo:celo:/: [ترکی] *قید.* *[گفتاری]* پێشاوپێش؛ پێشووتر؛ زووتر؛ لە پێشەوە؛ لە پێشدا؛ وەڵێنە؛ لە بەرەوە ‹جلوـجلو همسایەها خبر شدە بودند: پێشاوپێش دراوسێکان ئاگادار ببوون›.

**جلوخان** / celowxān, colow-, celo:-/، ـها/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* پێشدرگا؛ ژێردالان؛ پێشخانە؛ بەر دەرگای چوونە ژوور کە هێندێک چووبێتە پێشەوە یان سەری داپۆشرابێت.

**جلودار** / celowdār, colow-, celo:-/، ـها؛ ـان/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* جڵەودار: ۱. *[نظامی]* دەستەیەک کە لە پێش هێزی چەکدارانەوە دەڕۆن ۲. *[قدیمی]* هەوسارگر/ کێش؛ نوداکێش؛ جلەوکێش؛ جلەووار؛ جڵەودار؛ بەرگر؛ کەسێ کە لە پێشەوەی سوارەوە دەچوو و هەوساری ئەسپەکەی دەگرت و ڕێنوێنی دەکرد ۳. پێشگر؛ بەرگر؛ بەرهەڵست؛ گەپل؛ ئەوەی لە کاری کەسێ بەرگری دەکا.

⊡ **جلـودار کـسی نـشدن:** *[گفتـاری]* دەرەقـەت کەسێ نەهاتن؛ دەرۆستی کەسـێک نـەهاتن؛ دەروەن کەسێ نەهاتن؛ چار کەسێ نـەکردن؛ بەری کەسێ پێنەگیران.

**جل‌وزغ** / colvazaq ، ـها/: [عربی/ فارسی]*اسـم. [گفتـاری]* کـەز؛ کـەزی؛ قـەوزە؛ قـۆزە؛ کـەفزە؛ جلشین؛ جـەلاوی؛ گـاوک؛ قـەوزەی سـەراوان؛ وردیلە گیایەکی پێکەوە لکاوە کـە لـە سـەر ئـاو یان بەردەوە دەبینرێ.

**جلوس** / culûs, colûs/: [عربی]*اسم. [ادبی]* کـار یان ڕەوتی لە بان شـتێکەوە دانیـشتن؛ ڕوونـان؛ ڕۆنیـشتن؛ نیـشتن؛ ئەرەنیـشتەی؛ نیـشتەیرە. هەروەها: **جلوس کردن**

**جلوگیری** / -:celowgîrî,colow-,celo/: [ترکی/ فارسی]*اسم.* بەرگری؛ کار یا ڕەوتی بـەرگرتن لـە ئەنجامدانی کارێ یا قۆمیانی ڕووداوێ ‹جلوگیری از دعوا: بەرگری لـە شـەڕ›. هـەروەها: **جلـوگیری کردن**

**جلوه** / celve/: [عربی]*اسـم.* دیاردی: ١. کار یان ڕەوتی دەرکەوتن و سەرنج بەرەو خـۆ ڕاکێـشان ‹ماه از گوشەی افـق جلـوه کـرد: مانـگ لـە سـووچی ئاسۆوە دیاردیدا› ٢. /ـها/ ئـەوەی دەبێتـە هـۆی هـۆگرەتی و سـەرنج‌ڕاکێـشی ‹عکـس مـاه در آب جلـوەی خاصـی داشـت: وێنـەی مانـگ لـە ئاوەکـەدا دیاردیەکی تایبەتی هەبوو›.

⊡ **جلـوه دادن:** نوانـدن؛ نیـشاندان؛ نمانـای؛ ئرمانەی.

**جلوه داشتن:** بەرچاو بـوون/ گـرتن؛ بـەنموون بوون؛ چاو ڕفێن بوون؛ خـاوەن تایبەتمەنـدی سەرنج بەرەو لای خۆ ڕاکێشان.

**جلـوه فـروختن:** خـۆ نوانـدن؛ وێ ئرمانـەی؛ دەعیە و دەمار فرۆشتن.

**جلوه کردن:** ١. دیاردی/ دیاری دان؛ کەوتنـە دەرەوە؛ ئاشـکرا بـوون ٢. سـەرنج ڕاکێـشان؛ کەوتنە بەرچاو.

**جلـوه‌گـر** / celvegar/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت.* ئاشکرا؛ دیاریـدە؛ پـەیا ‹سـرانجام مهتـاب از پـشت درختان جلـوه‌گـر شـد: ئـاخری مانگەشـەو لـە پـشت دارەکانەوە ئاشکرا بوو›.

**جلوه گـری** / celvegarî/: [عربـی/ فارسـی]*اسـم.* دیاریدەری: ١. دۆخ یان چۆنیـەتی دەرکـەوتن؛ دیاریدەر بوون ٢. کار و ڕەوتی خۆ نوانـدن؛ خـۆ نیشاندان؛ سەرنجی بینەر بۆ لای خۆ کێشان.

**جلوی**[١] / celovî, colovî/: [ترکی] *صفت.* بـەروو؛ بەرەوە؛ بەرگین؛ بەرین؛ پێشوو؛ وەڵین؛ ئەوی لە پێشەوەیە ‹چرخ جلوی پنچر شـد: تەگـەرەی بـەروو پەنچەر بوو›: **جلویی**

**جلوی**[٢] / ـها/: ضـمیر. بـەروو؛ بـەرگین؛ بـەرین؛ پێشەوە؛ پێشوو؛ وەڵـین؛ ئـەوەی لـە بەرەوەیـە ‹جلوی پنچر شد: بەروو پەنچەر بوو›: **جلویی**

**جلویی** / celoyî, coloyî/: [ترکـی] ☜ **جلـوی: جلوئی**

**جلی** / calî/: [عربـی] *صفت. [ادبی]* ئاشـکرا؛ دیـار؛ دیاریدەر؛ پەیا؛ بەرچاو؛ ڕوون.

**جلیتقه** / celîtqe/: [ترکی] ☜ **جلیقه**

**جلیس** / calîs/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* هاونـشین؛ هاودەم.

**جلیقـه** / celîqe ، ـهـا/: [ترکـی]*اسـم.* جلیـسقە؛ جلیقە؛ جلیتقە: ١. چـۆخ؛ پەسـتەک؛ فەرمانـە؛ کنجی بێقۆڵی بەرباز ٢. وەها پۆشەنێک کە بـۆ خـۆ پاراسـتن دەیپۆشـن ‹جلیقـەی ضـدگلوله: جلیسقەی گوللەنەبڕ› ✻ **جلیتقه**

⊡ **جلیقـەی ضـدگلوله:** جلیقـەی گوللەنەبـڕ؛ جلیقەیەک کـە لـە ژێـر جلـەوە دەیپۆشـن و گوللە کاری لێناکا.

**جلیقـــەی نجـــات:** جلیـــسقەی نـــەجات؛ جلیسقەیەک کـە بـای تێـدەچێ و لـە کـاتی پێویستدا بۆ پاراستن لە خنکان یـان کـوتران دەیبەستن.

**جلیل** / calîl/: [عربـی] *صفت. [ادبـی]* ١. مـەزن؛

مـــازن؛ گـــەورە؛ بـــەڕێز؛ ڕێـــزدار ۲. شـــکۆدار؛ خاوەن‌شکۆ.

**جلیل القدر** / calîlolqadr/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ۱. پایەبەرز؛ بڵندپایە؛ پلە بەرز ۲. بەڕێز؛ هێژا.

**جم** / com/: *اسم. [گفتاری]* جووڵە؛ جم؛ جوو؛ فزە؛ فز؛ فززە؛ تەکان؛ جمس؛ جمسک.

▣ **جم خوردن**: جوولیانەوە؛ جووڵیانەوە؛ جوولیایوە؛ تەکان خواردن؛ جم خواردن؛ فزە کردن؛ بزووتن؛ جمین؛ جوین؛ جمەی.

**جماد** / camād، ـات/: [عربی] *اسم.* کـرەک؛ نەجووڵ؛ بێ‌جووڵە؛ تەنێ کە لە تایبەتمەندیەکانی زینەوەران ـ نەخوازا ژیان، گەشە و زا و زێیی ـ بێ بەشە.

**جمادات** / camādāt/: [عربی] *اسم.* نەجووڵان؛ یەکێ لە سێ زنجیرەی سەرەکی بوونەوەران کە بریتیە لە هەموو تەنە بێ‌گیانەکان.

**جمادی‌الاول** / camādîyalavval, camādel-/: [از عربی] ☜ **جمادی‌اوّل**

**جمادی‌الثانی** / camādîyassanî, camādis-/: [از عربی] ☜ **جمادی‌ثانی**

**جمادی‌اول** / camādî'avval/: [از عربی] *اسم.* جەمادی‌ئەوەڵ؛ مانگی پێنجەم لە ساڵی کۆچی مانگی: **جمادی‌الاوّل؛ ج۱**

**جمادی ثانی** / camādîsānî/: [از عربی] *اسم.* جەمادی‌سانی؛ مانگی شەشەم لە ساڵی کۆچی مانگی: **جمادی‌الثانی؛ ج۲**

**جمازه** / cammāze، ـها/: [عربی] *اسم.* وشتری بەلەپا.

**جماع** / cemā'/: [عربی] *اسم.* سەرجێیی؛ کاری ڕازان؛ جووت بوونی ژن و پیاو بە نیازی جینسی.

**جماعات** / camā'āt/: [عربی] ☜ **جماعت**

**جماعت** / camā'at، ـها؛ جماعات/: [عربی] *اسم.* ئاپۆرە: ۱. مەردم؛ خەڵک؛ خەڵکی ۲. کۆمەڵ؛ دەستە؛ گرۆ؛ پەل؛ گەل؛ کۆما.

**جمال** / camāl/: [عربی] *اسم. [ادبی]* جوانی: ۱. ڕازاوەیی ‹در حکمت و علم است جمال تن مردم: لە تێگەیشتوویی و زانستایە جوانی بۆ لەشی خەڵکی› ۲. خوجوانی؛ زەریفی؛ سپەهی؛ جوانخاسی؛ خۆشیکی؛ خۆشکۆکی؛ خشکۆکی؛ شەنگی؛ قۆزی ‹بدین کمال نباشد جمال انسانی: بەو پلە و پایە ناگا هەرگیز جوانی مرۆ› ۳. *[مجازی]* ڕوومەتی جوان؛ زەریف؛ خوجوان.

**جماهیر** / camāhîr/: [عربی] *اسم.* ۱. جمعِ ☜ **جمهور** ۲. جمعِ ☜ **جمهوری**

**جماهیری** / camāhîrî/: [عربی] *صفت.* کۆماری؛ خەڵکی؛ کۆمەڵی؛ جڤاتی؛ مەردمی.

▣ **اتحاد جماهیری** ☜ **اتّحاد**

**جمبوری** / cambûrî، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* گهانی؛ جڤاتی نێونەتەوەیی؛ کۆ بوونەوەی گەورەی نێونەتەوەیی.

**جمجمه** / comcome/: [عربی] *اسم.* ئێسکەسەر؛ کەللەسەر؛ قاف؛ قاپیلکەسەر؛ قاقلۆک؛ قەحف؛ کاپۆل؛ کاپۆڵ؛ کەپۆلە؛ کەپوو؛ کاپۆلک؛ کات؛ کاتات؛ کاتک؛ کاژە؛ کاژەڕە؛ کاژەڵە؛ کاژەلاک؛ کافا؛ کاکۆت؛ کۆلۆخ؛ کاجیر؛ کاجیڕ؛ پیت؛ قەحفی سەر؛ کاسەی سەر کە لە مرۆدا لە هەشت ئێسک پێکهاتووە.

**جمجمه‌شناسی** / comcomešenāsî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کاپۆلناسی؛ زانستێ کە لە جیاوازی ئەندازە، بیچم و ڕێژەی کاپۆڵی ڕەگەزگەلی جۆراوجۆری مرۆ دەکۆڵێتەوە.

**جمع**[1] / cam'، ـها/: [عربی] *اسم.* کۆ؛ کۆم؛ گرد: ۱. کۆڕ؛ کۆمەڵەیەک بریەتی لە چەن کەس یان چەن شت ‹جمع دوستان: کۆڕی دۆستان› ۲. جەم؛ جەمع؛ یەکێ لە چوار کاری سەرەکی حیساب ۳. سەرجەم؛ سەرکۆ؛ گردپەڕ؛ کۆمە ٤. کاری کۆ کردنەوە؛ گلێرکردنەوە ‹جمع ثروت: کۆ کردنەوەی دارایی›.

▣ **جمع اضداد**: کۆی دژان؛ کۆ بوونەوەی شتانی

دژ به یەک لە جێیەکدا.

**جمعِ کل:** گرد؛ کۆی گشت؛ کۆی چەن کۆ.

**جمع مکسّر:** کـۆی شـکاو؛ جۆرێـک شـێوەی کۆکردنەوە لە زمانی عەرەبیدایـە کـە دەبێتـە هـۆی گـۆڕانی بیچمـی وشـەکە (وەک: کـۆی «عامل» کە دەبێتە «عَمَلە»، یـان کـۆی «ذخیـرە» دەبێتە «ذخایر»).

**جمع**[2]**:** *صفت.* کـۆ؛ جـەم؛ جەمـەوکراو؛ کۆوەبوو لە جێیەکدا.

◘ **جمع آمدن** ☜ **جمع شدن ــ۱**

**جمع آوردن** ☜ **جمع کردن ــ۱**

**جمع بستن:** ۱. *[دستور]* کـۆدان؛ کـۆوەدان؛ بـە شێوەی ناوی کۆ بە کارهێنان ‹برای جمع بستن جانداران «ان» بە کار می‌برند: بۆ کۆدانـی گیانداران «ان» دادەنـێن› ۲. *[حساب]* کـۆ کردنـەوە؛ کۆوەکردن؛ ئەنجامدانی کاری کۆ.

**جمع بودن:** جـەم بـوون: ۱. کـۆ بـوون لـە جێیەکدا ‹همە توی خانەی ما جمع بودند: هـەموو لە ماڵی ئێمەدا جـەم بـوون› ۲. لـە جـێ خـۆ بوون؛ لە سەر جێ بـوون ‹حواست جمع باشد: بیرت لە جێ خۆی بێ›.

**جمع زدن:** کۆکردنـەوە؛ لێـک کۆکردنـەوە؛ ئەنجامـدانی کـاری کـۆ؛ بـە دەسـهێنانی ئەنجامی کۆکردنەوەی چەن هەند ‹این ستون را جمع بزن!: ئەم ئەستوونە لێک‌کۆکەوە!›.

**جمع شدن:** ۱. کۆ بوونەوە؛ کۆوە بـوون؛ گـرد بین؛ ڤەجەمین؛ ڤەجەمیان؛ جڤات کرن؛ گلێر بیەیوە؛ لە جێیـەک و لـە لای یەکـدا مانـەوە ‹توی خانەی آزاد جمع شدیم: لـە مـاڵ ئـازاددا کـۆ بووینـەوە›: **جمـع آمـدن** ۲. کـۆ بوونـەوە؛ ڤەجەمین؛ ڤەجەمیان؛ پەنگ خواردنەوە؛ گرد بیین؛ بە شێوەی کۆما بە سەر یەکـدا کـەوتن ‹توی چالە آب جمع شدە بود: لە چاڵـەکەدا ئـاو کـۆ بـووەوە› ۳. چوونـە یـەک؛ کـەم بوونـەوەی بارستایی یان ڕووی شتێ (وەک بە هۆی سەرما یان گوشارەوە) ‹از سرما جمع شدە بود: لـە بـەر سەرما چووبووەیەک›.

**جمـع کـردن:** کۆکردنـەوە: ۱. ڤـەجەماندن؛ ڤەهەواندن؛ ڕەبساندن؛ گردکـردن؛ گۆجیـان؛ گلێرەوەکەردەی؛ لە پاڵ یەکتردا دانان ‹مـردم را دور خودش جمع کرد: خەڵـکی بـە دەور خـۆدا کـۆکردەوە›: **جمـع آوردن** ۲. کۆمـا کـردن؛ قەلاچین کەردەی؛ قەلاتەکردن؛ لە سەر یەک دانان ۳. هەڵگرتن؛ جەمـەوکردن؛ ماشـتنەوە؛ ماشـتەیوە ‹پولهـا را از روی زمـین جمـع کـردم: پارەکـانم لـە سـەر زەوی کـۆکردەوە› ٤. کـۆ لێکدان؛ کۆ بەستنەوە؛ ڤەجەماندن.

**جمع‌آوری** / cam'āvarî, ca:māvarî /: [عربی/ فارسی]*اسم.* کار یان ڕەوتی کۆکردنەوە و بەرگری لە بڵاو بوونەوە یان پەرەگرتن ‹قرار است گدایان را از سطح شهر جمع‌آوری کنند: بڕیارە سواڵـکەر لـە نێـو شاردا کۆکەنەوە›.

**جمعاً** / cam'an/: [عربی]*قید.* پێکەوە؛ بە یەکـەوە؛ سەرهەم؛ سەرجەم؛ یـۆوە؛ تێکـڕا؛ پێکـڕا؛ وێکـڕا ‹جمعاً چهار نفر بودیم: پێکەوە چوار کەس بووین›.

**جمع‌بندی** / cam'bandî, ca:m- ، ـها/: [عربی/ فارسی]*اسم.* گردوکۆ؛ کورت‌وکۆ؛ کـار یـان ڕەوتی کـورت کردنـەوە و بـە ئـەنجامگەیـشتن لـە سەرجەمی باس و بەڵگەکان ‹جمع‌بندی صحبتها با شما: گردوکۆی قسەکان لە ئەستۆی ئێوە بێ›.

**جمع‌پذیر** / cam'pazîr, ca:m- /: [عربی/ فارسی] *صفت.* کۆوەگر؛ بە تایبەتمەندی یان توانای کۆوە بـوون لـە جێیەکـدا یـان پێکـەوە. هـەروەها: **جمع‌پذیری**

**جمعـداری** / cam'dārî /: [عربی/ فارسی]*اسم.* ۱. کار یان ڕەوتی چاوەدێری لە ماڵ یان دارایی دامەزراویـەک ۲. پلـە و پایـەی خـاوەن کـۆ. هەروەها: **جمعداری اموال**

**جمع‌کننده** / cam'konande ، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی]*اسم.* کۆکەرەوە؛ کۆوەکەر.

**جمع‌ گرایی** / cam'gerāyî/: [عربی/ فارسی] ☜ **کثرت‌گرایی**

**جمع‌وجور** / cam'-o-cûr/: [عربی/ فارسی] صفت. *[گفتاری]* ۱. جەموجۆر؛ گرد(و)پڕ؛ کن‌کوو؛ قنج؛ پۆڕ ‹اتاق را جمع‌وجور کردیم: دیوەکەمان جەموجۆر کرد› ۲. تەکووز؛ گیف؛ ئامادە؛ بەرهەڤ ‹همه چیز جمع‌وجور است: هەموو شتێ تەکووزە› ۳. ڕێک‌وپێک ‹خانەی جمع‌وجوری داشت: خانوویەکی ڕێک‌وپێکی هەبوو›.

◘ **جمع و جور کردن**: ڕێک‌وپێک کردن؛ هەڵپەرتاوتن؛ هەڵووەژارتن؛ پەسینەی؛ پەسارنایوە ‹فردا مهمان داریم، باید خانه را جمع‌وجور کنیم: سبەینێ میوانمان هەیە، ئەبێ خانووەکە ڕێک‌وپێک کەین›.

**جمعه** / com'e ، ـها/: [عربی]/اسم. هەینی؛ ئەینی؛ هەینۆ؛ هەنی؛ هەینوو؛ ئین؛ یەنە؛ جومعە؛ ناوی ڕۆژی حەوتەم (و دوایین ڕۆژ)ی حەوتەی ئێرانی: **آدینه**

**جمعه‌بازار** / com'ebāzār ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. جومعەبازاڕ؛ بازاڕێ کە لە ڕۆژی هەینیدا دادەمەزرێ.

**جمعه‌شب** / com'ešab ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. شەوی دوای ڕۆژی هەینی؛ شەوی شەممە.

**جمعی** [1] / cam'î/: [عربی] صفت. کۆمەڵی؛ کۆمەڵتەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کۆمەڵێک ‹وظایف جمعی: ئەرکی کومەلی›.

**جمعی** [2]: قید. بەگشتی؛ پێکەوە؛ پێکرا؛ تێکرا؛ سەرجەم؛ بەگەل؛ یۆوە؛ بە شێوەی کۆمرەیی ‹جمعی بلند شدیم و رفتیم پیش رییس: بەگشتی هەستاین و ڕۆیشتین بۆ لای بەرپرس›.

**جمعی** / cam'î:/: [عربی] ضمیر. کۆمەڵێک؛ تاقمێک؛ چینێ؛ پەلێ؛ پۆلێ؛ دەستەیەک؛ بەشێکی ناڕوون لەوەی کە ئاماژەی پێ‌دەکرێ ‹جمعی بلند شدند و رفتند: کۆمەلێک هەستان و ڕۆیشتن›.

**جمعیت** / cam'îyyat/: [عربی]/اسم. ۱. ئاپۆرە؛ کۆمار؛ جەماوەر؛ حەشیمەت؛ جەمجاخ؛ هەموو خەلک یان دانیشتوانی وڵات یان دەڤەرێک ‹جمعیت دنیا: ئاپۆرەی دنیا› ۲. ئاپۆرە؛ کۆمرە؛ کۆمای کەسانێ کە ناوچەیەکیان داگرتووە یان کۆمەڵەیەکیان پێکهێناوە ‹جمعیت زیر بیست سال: ئاپۆرەی ژێر بیست ساڵ› ۳. ـها/ کۆڕ؛ ئەنجومەن ‹جمعیت پزشکان بدون مرز: کۆڕی بژیشکانی بێ‌سنوور› ٤. بار و دۆخ و چۆناوچۆنی کۆ بوون؛ جەم بوون ‹جمعیت خاطر: خاترجەمی›.

**جمعیت‌شناسی** / cam'îyyatšenāsî/: [عربی/ فارسی]/اسم. جەماوەرناسی؛ ئاپۆرەناسی؛ زانستی لێ‌ڕوانین و خوێندنەوەی جەماوەری مرۆڤ،پێکهاتە، گەشە و گۆڕانیان.

**جمل** / comal ، ـها/: [عربی]*[نامتداول]* جمعِ ☜ **جمله**

**جملات** / comalāt/: [عربی] جمعِ ☜ **جمله**

**جملگی** [1] / comlegî/: [عربی/ فارسی] صفت. هەموان؛ گشتی؛ گردی؛ هەموو؛ جەمین؛ بە گشتیەوە ‹جملگی حاضران خندیدند: هەموو ئامادە بووان پێکەنین›.

**جملگی** [2]: قید. بەگشتی؛ هەموانی؛ گرد؛ هەموو؛ بە گشتیەوە؛ هەرهەموو؛ بە شێوەی گشتی ‹این حرف را جملگی پذیرفتند: بەگشتی ئەم قسەیان قەبووڵ کرد›.

**جملگی** [3]: ضمیر. هەموو؛ گشت؛ بەگشتی؛ تێکرا؛ گرد؛ ویکرا؛ پێکەوە ‹جملگی بلند شدیم و رفتیم: هەموو هەستاین و ڕۆیشتین›.

**جمله** [1] / comle ، ـها؛ جملات؛ جُمَل *[نامتداول]*/: [عربی]/اسم. *[دستور]* ڕستە؛ هەڤۆک؛ یەکەی وتار کە لە باری واتاوە سەر بە خۆیە و لە وشە یان چەند وشەی پێوەندیداری ڕێزمانی پێکهاتووە.

◘ **جمله‌ی اخباری**: ڕستەی هەواڵی؛ ڕستەیەک کە هەواڵ لە شتێک دەدا: **جمله‌ی خبری**

**جمله‌ی استفهامی** ☜ **جمله‌ی پرسشی**

**جمله‌ی اصلی** ☜ **جمله‌ی پایه**

**جمله‌ی التزامی:** ڕسته‌ی ناسه‌ربه‌خۆ؛ ڕسته‌یه‌ک که کاری ئه‌گه‌ری تێدابێ (وه‌ک: اگر خورشید برآید: ئه‌گه‌ر خۆر ده‌رکه‌وێ).

**جمله‌ی پایه:** ڕسته‌ی بنه‌ما؛ ڕسته‌ی سه‌ره‌کی؛ ڕسته‌یێک که به ڕسته‌یه‌کی‌تر پڕ و پۆڕ ده‌بێته‌وه: **جمله‌ی اصلی**

**جمله‌ی پرسشی:** ڕسته‌ی پرسیاری؛ ڕسته‌ی پرسه‌کی؛ ڕسته‌یه‌ک که پرسیاری تێدایه (وه‌ک: آرام کجا بودی؟: ئارام له کوێ بووی؟): **جمله‌ی استفهامی**. هه‌روه‌ها: **جمله‌ی امری؛ جمله‌ی تمنایی؛ جمله‌ی خواهشی؛ جمله‌ی دعایی.**

**جمله‌ی پیرو:** ڕسته‌یه‌ک که بۆ ته‌واو کردنی ڕسته‌ی بنه‌ما ده‌گوترێ: **جمله‌ی تبعی**

**جمله‌ی پیوسته:** ڕسته‌ی لکاو؛ ڕسته‌یه‌ک که له‌گه‌ڵ ڕسته‌یه‌کی‌تردا، له باری وته یان ماناوه پێوه‌ندی هه‌بێ.

**جمله‌ی تبعی** ☜ **جمله‌ی پیرو**

**جمله‌ی خبری** ☜ **جمله‌ی اخباری**

**جمله‌ی عاطفی:** ڕسته‌ی هه‌ستی؛ ڕسته‌یه‌ک که هه‌ستێکی وه‌ک خۆشی، په‌سن، سه‌رسووڕمان، ئێش و... نیشان بدا.

**جمله‌ی کامل:** ڕسته‌ی ته‌واو؛ هه‌ڤۆکا سه‌رخۆ؛ ڕسته‌ی پڕ و پۆڕ. به‌رانبه‌ر: **جمله‌ی ناقص**

**جمله‌ی معترضه:** ڕسته‌ی ڕاژه‌یی؛ ڕسته‌یه‌ک که به شێوه‌ی ڕاژه له نێو وته‌دا ده‌گوترێ، به بێ ئه‌وه‌ی له باری ڕێزمانیه‌وه، له‌گه‌ڵ بابه‌ته‌که‌دا په‌یوه‌ندی هه‌بێ.

**جمله‌ی ناقص:** ڕسته‌ی ناته‌واو؛ ڕسته‌یه‌ک که به ته‌نیایی مانایه‌کی ڕوونی نه‌بێ و به ڕسته‌یێ‌تر واتاکه‌ی ته‌واو ببێ. به‌رانبه‌ر: **جمله‌ی کامل**

**جمله**[۲]: *صفت. [ادبی]* گشت؛ گش؛ هه‌موو؛ گرد؛ سه‌رجه‌م؛ ته‌واو ‹جمله مردم: هه‌موو خه‌ڵک›.

**جمله‌بندی** / comlebandî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ڕسته‌به‌ندی: ۱. پێکهاته‌ی ڕسته ‹جمله‌بندی شما غلط است: ڕسته‌به‌ندی ئێوه هه‌ڵه‌یه› ۲. ڕسته‌سازی ‹بلد نیستم جمله‌بندی کنم: نازانم ڕسته‌به‌ندی بکه‌م›.

**جمله‌پردازی** / comlepardāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ڕسته‌ڕێسی؛ وتنی ڕسته‌ی ئاراسته و بێناوه‌ڕۆک.

**جمله‌سازی** / comlesāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ڕسته‌سازی؛ ڕه‌وتی درووس‌کردنی ڕسته.

**جمنده** / comande ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* مێروو؛ جڕ؛ حه‌شه‌ره.

**جمود** / cumûd, comûd/: [عربی]/*اسم.* ۱.ڕه‌قی؛ سفتی؛ سه‌ختی؛ وشکی ۲. کڕه‌کی؛ نه‌جووڵی؛ بێجووله‌یی.

▣ **جمود فکری:** بیر وشکی؛ مێشک وشکی.

**جمهور** / comhûr ، جماهیر/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. کۆمار؛ کۆمره؛ کۆمه‌ڵه ۲. خه‌ڵک؛ خه‌ڵکی؛ مه‌ردم؛ ئاپۆره؛ جه‌ماوه‌ر.

**جمهوری** / comhûrî ، ـها؛ جماهیر/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* کۆماری؛ جڤاتی؛ کۆمه‌ڵی؛ حکوومه‌تێ که سه‌رۆکی له لایه‌ن خه‌ڵکه‌وه هه‌ڵده‌بژێردرێ.

▣ **جمهوری اسلامی:** کۆماری ئیسلامی؛ حکوومه‌تێ که قانوونه‌کانی وه‌رگیراو له ئایینی ئیسلامه‌وه ده‌زانێ.

**جمهوری توده‌ای/ خلق:** کۆماری کۆمایی؛ کۆمارێ که ڕێبه‌رایه‌تی له ئه‌ستۆی کۆمه‌ڵ یان ڕێکخراوه‌یه‌کدایه.

**جمهوری دمکراتیک:** کۆماری دیمۆکراتیک؛ ده‌وڵه‌تی کۆماری به شێوه‌ی هه‌ڵبژاردنی ڕاسته‌وخۆ و کۆڕی قانووندانه‌ریانه‌وه.

**جمهوری سوسیالیستی:** کۆماری سوسیالیستی؛ کۆماری خاوه‌ن ڕێوشوێنی سه‌ر به سوسیالیزم.

**جمهوری فدرال/ فدراتیو:** کۆماری فدراڵی؛

کۆمـارێ کـه لـه چەنـد ئەیالـەتی سـەربەخۆ پێکهاتووە.

**جمهوریت** / comhûrîyyat/: [عربی]/اسم. کۆمار؛ کۆماری؛ جڤاتی؛ دوزەنەی جڤاتی؛ کۆمارەتی.

**جمهوریخواه** / comhûrîxāh ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. کۆمـاریخواز؛ کۆمـاریواز؛ سـەر بـه ڕێخراوەی کۆماریخواز.

**جمیع** / camî'/: [عربـی] صـفت. گـشت؛ گـش؛ هەموو؛ گرد؛ پاک؛ سەرپاک ‹جمیـع مـردم: گـشت خەڵکی›.

**جمیعاً** / camî'an/: [عربی] قید. بەگشتی؛ هـەمی؛ سەر لە بەر؛ تێکرا.

**جمیل** / camîl/: [عربی] صفت. [ادبی] ۱. شـەنگ؛ شـــەپاڵ؛ جـــوان؛ زەریـــف؛ ڕوومـــەت جـــوان؛ خۆشیک؛ خوشکۆک؛ جوانخاس؛ کەلـەش؛ قـۆز ۲. باش؛ چاک؛ خاس؛ عال.

**جن** / cen(n) ، ـها؛ اجنّه/: [عربـی]/اسم. جنۆکـه؛ جندۆکـه؛ جندووکـه؛ جنـد؛ ژنۆکـه؛ ئەجنـه؛ جوانەزما؛ جن؛ سەرکڕنیک؛ بوونەوەرێکی نەدیار کــه وا دیــاره هەڵــس‌ونــشتی وەک مرۆیــه و هێزێکی بە دەر لە سروشتی هەیه.

▣ **جن بوداده:** [مجازی] جنۆکه؛ چزلیک؛ مرۆی کورتەباڵای بەونژمی زیتەڵ.

**جن و بسم‌الله:** [مجازی] مشک و پشیله؛ کتـک و مشک؛ پشی و سەگ؛ کتـه و مـڵه؛ کـارد و پەنیر؛ دوو کەس یان دوو شتی نەیار و دژ بـه یەک.

▣ **جـن تـوی جلـد کـسی رفـتن:** جـن کەسـێ پێکان؛ جنۆکه دەس لە کەسێ وەشاندن.

**جنائی** / cenā'î/: [عربی] ☜ **جنایی**

**جناب** / cenāb, canāb ، ـان/: [عربی]/اسم. کاکـه؛ بەڕێز؛ گەورە؛ هێژا؛ جەناب؛ وشەی ڕێز گرتن لە گەورەکان.

▣ **جناب اشرف:** میرمەزن؛ وشەی ڕێزگـرتن بـۆ گــەورەپیاوانی حکوومــەتی و دەوڵــەمەندان: **حضرت اشرف**

**جناب عالی** ☜ **جنابعالی**

**جنابـــت** / canābet/: [عربـــی]/اســـم. [فقـــه] لەش‌پیسی؛ کازێری؛ بێ غوسلی.

**جنابعالی** / cenābālî, cenābe'ālî/: [عربی] ضمیر. بەڕێزتان؛ وشەی ڕێزلێنان و ڕەسمی بۆ بیسەری تاک ‹خدمت جنابعالی عرض می‌شود کـه...: خزمـەتی بەڕێزتان ڕادەگەیێندرێت کە ...›: **جناب عالی**

**جنات** / cannāt/: [عربی] جمعِ ☜ **جنّت**

**جناح** / cenāh ، ـها/: [عربـی]/اسـم. ۱. لا؛ لایـەن؛ هەرکام لە دوو لایەنی چەپ یا ڕاستی مەیـدان، حەوش یا ماڵێک ‹از جناح راست حمله کرد: لـە لای ڕاستەوە پەلاماری دا› ۲. باڵ؛ هەرکام لە دوو باڵی چــەپ یــان ڕاســتی گرووپێکــی ئەرتەشــی یــا وەرزشی ‹بازیکن جناح چپ: کایەکەری باڵی چەپ› ۳. باڵ؛ لایەن؛ هەرکام لە دوو لـەقی جۆراوجـۆر لە دەسته یان دامەزراوەیەکدا ‹جناح محافظـه‌کـار: باڵی پاوانخواز›.

**جناح‌بندی** / cenāhbandî ، ـها/: [عربـی/ فارسـی] /اسم. لایەنکاری؛ دەستەبەشی لە نێوان گـرۆ یـان دامەزراوەیێکدا.

**جناحین** / cenāheyn/: [عربی]/اسم. هـه ر دوولا؛ هەر دووباڵ.

**جنازه** / cenāze ، ـها/: [عربی]/اسم. تەرم؛ مـەیت؛ جەنازە؛ کەلاخ؛ جەندەک؛ لاشەی مردوو.

**جناس** / cenās ، ـها/: [عربی]/اسم. [بـدیع] دوو یـا چەند وشه کە لە بـواری پیـت یـان خوێندنـەوە وەک یەک بن و لە مانادا جیاواز: **تجنیس**

▣ **جناس تام:** ئـەوەی لـە پیـت و خوێندنـەوەدا بەتەواوی وەک یەک بن، بـەلام بـه دوو مانـا (وەک شێر «دڕندە» و شیر «بۆ ئاو»).

**جناس خط:** ئەوەی لە نووسیندا یەکسان و لـه خاڵدا جیاوازن (وەک ناز و باز).

**جناس زایـد:** جیناسـێ کـه تێیـدا وشـەیەک پیتێکی لە وشەکەیتر زیاتر بێ (وەک: سـەگ

و سەنگ).

**جناس لفظ:** ئەوەی لە نووسیندا جیاواز و لە خوێندنەوە وەک یەک بن (کە لە ڕێنووسی کوردیدا نەماوە، وەک: حیات و حیاط).

**جناس مرکب:** جیناسی لێکدراو؛ جیناسێ کە یەکێ لە دوو وشەکە سادە و ئەوی‌تر لێکدراوە (وەک ڕێ بوار و ڕێبوار).

**جناس ناقص:** جیناسێ کە لە پیتەکاندا وەکوو یەک بن و لە خوێندنەوەدا جیاواز (کە ڕێنووسی کوردی نەیهێشتووە، وەک: گُل و گِل).

**جناغ** / cenāq ، ـها:/*اسم.* چەڵەمە؛ چۆڵەمە؛ چەمەڵە؛ چۆڵەمێ؛ قەفەل؛ قەڵەمە: ۱. ئێسکی چۆڵەمە ۲. *[گفتاری]* چەڵەمەی مریشک.

◘ **جناغ شکستن:** ۱. چەڵەمەشکانێ؛ چەڵەمەشکێنە؛ چلەمشکانێ؛ چلەمشکانە؛ چەڵەمە مارەی؛ جۆرە گرێوێکی بە چەڵەمەی مریشکە کە ئەگەر یەکێ لە دوو لا شتێ بداتە دەستی ئەوی دیکەوە و ئەویش نەیژی «لەبیرمە»، بردوویەتەوە ۲. *[کنایی]* مەرج کردن؛ گرێو کردن.

**جناغی** / cenāqî:/*اسم.* چەڵەمەیی؛ جۆرێ نەخشی وەکوو حەوت و هەشتی لە پەنای یەک: **جناقی**

**جناقی** / cenāqî ☜ **جناغی**

**جنان** / cenān:/ [عربی] جمعِ ☜ **جَنّت**

**جنایات** / cenāyāt:/ [عربی] جمعِ ☜ **جنایت**

**جنایت** / cenāyat ، ـها؛ جنایات:/ [عربی]/*اسم.* جەنایەت؛ هۆقەبەر: ۱. *[حقوق]* هەر کارێکی نارەوا وەکوو مرۆڤ‌کوژی، دەس‌درێژی و دزی کە شیاوی سزادانە ۲. *[مجازی]* مرۆکوژی ۳. *[مجازی]* کاری زۆر دزێو و نارەوا.

**جنایت‌آمیز** / cenāyatāmîz:/ [عربی/ فارسی] *صفت.* جەنایەتاوی؛ تێکەڵاو بە جەنایەتەوە.

**جنایت‌پیشه** / cenāyatpîše ، ـها؛ ـگان:/ [عربی/ فارسی] *صفت.* خووگرتوو بە جەنایەت کردنی جۆربەجۆر.

**جنایتکار** / cenāyatkār ، ـها؛ ـان:/ [عربی/ فارسی] *صفت.* جەنایەتکار؛ گاناوەر؛ بە کردەوەی جەنایەتکارانە (جنایتکار درحین فرار کشته شد: جەنایەتکارەکە لە کاتی هەڵاتندا کوژرا).

**جنایتکارانه** / cenāyatkārāne:/ [عربی/ فارسی] *صفت.* جەنایەتکارانە؛ بە کار و کردەوەی تێکەڵ بە جەنایەتەوە (رفتار جنایتکارانە: کردەوەی جەنایەتکارانە).

**جنایی** / cenāyî:/ [عربی] *صفت.* جینایی؛ پێوەندیدار بە جەنایەتەوە: **جنائی**

**جنب** / canb:/*اسم.* *[کالبدشناسی]* پەردەسی؛ پەردەیەک کە سی دادەپۆشێ: **پردەی جنب**

**جنب** / cambe, canbe:/ [عربی] *حرف.* لای؛ پاڵی؛ بنچغی؛ تەنشتی؛ تەنیشتی؛ بنپاڵی؛ بن‌دەسی؛ بن‌دەستی؛ پەنای؛ ئالی؛ تەشکی؛ جمی؛ دەڤی؛ کەناری؛ کنی؛ نکی؛ ڕەخی؛ جەمی؛ لاوی؛ قەراغی (دکان جنب سینما: دووکانی لای سینەما).

**جنب** / conob:/ [عربی] *صفت.* *[فقه]* لەش‌پیس؛ لەش‌چەپەڵ؛ غوسڵ لە سەر.

**ـجنب** / comb, conb:/ *پیوازه.* ــ ئاخێز؛ ـخێز؛ ـجووڵ؛ ـ جم؛ ـ بزۆ؛ ـ لڤ؛ ـ لەوێن؛ جووڵەر (زودجنب؛ دیرجنب: زووئاخێز؛ دێرئاخێز).

**جنبان**[1] / combān, conbān:/ *صفت.* لەوێن؛ جووڵان؛ جووڵێن؛ لەقێن؛ بزوێن؛ جوێن؛ لەبت؛ بە جم و جووڵ.

**ـجنبان**[2]: *پیوازه.* ـ بزوێن؛ ـ جووڵێن؛ ـ جوێن؛ ـ لەقێن؛ ـ لەوێن؛ ـ نرڤێن؛ لەبتێن؛ جووڵێنەر؛ جمنەر (سلسله‌جنبان: زنجیرەبزوێن).

**جنباندن** / combāndan, conbāndan:/ *مصدر.* *متعدی.* // **جنباندی:** جووڵاندت؛ **می‌جنبانی:** دەجووڵێنی؛ **بجنبان:** بجووڵێنە// جووڵاندن؛ جووڵانن؛ جمەنە؛ هەژاندن؛ ڕاژاندن؛ هێژاندن؛ جووڵاندنەوە؛ هەژکاندن؛ هەرکاندن؛ بزاوتن؛

تـه‌کان پێـدان؛ له‌رانـدن؛ ژه‌نـدن؛ ڕاتـلـه‌کان؛ ڕاتـــلـه‌کاندن؛ ته‌کانـــدن؛ جـــوان؛ شـــانین؛ فه‌هه‌ژانـــدن؛ مه‌رانـــدن؛ جمانـــدن؛ جـــڤاندن؛ ڤرڤراندن؛ ڤه‌خوماندن؛ جه‌مقانـدن؛ چه‌لکانـدن؛ له‌بتانـدن؛ زیـوان؛ جوولـنه‌ی؛ ئه‌وه‌جوولـنه‌ی؛ جوولـنایوه؛ له‌قانـدن؛ لـڤاندن: ۱. بـه ڕاسـت و چه‌پ، به‌ر و دوا، یان سه‌روخواردا ته‌کان‌دان ‹دم جنباندن: کلک جوولانـدن› ۲. بزوانـدن؛ جمنـه‌ی؛ جمنایره؛ خستنه بزووتنه‌وه ‹او را از جایش جنبانـد: لـه جێکه‌یـدا بزوانـدی› ❊ **جنبانیـدن**. هـه‌روه‌ها: **جنباندنی**

■ صـفت فـاعلی: **جنباننـده** (جوولـێنه‌ر)/ صـفت مفعـولی: **جنبانـــده** (جوولـــێنراو)/ مـصدر منفـی: **نجنباندن** (نه‌جوولاندن)

**جنبانیـــدن** / combānîdan, conbānîdan/ ☜ **جنباندن**

**جنبش** / combeš, conbeš ، ـها:/اسم. کـار یـان ڕه‌وتی جوولانه‌وه؛ بزووتنه‌وه: ۱. جوولـه؛ بـزاڤ؛ بزاو؛ له‌بت؛ له‌ره؛ ژیل؛ ته‌کان؛ جمشت؛ کار یـان ڕه‌وتی گۆڕانی دۆخ یان شـوێن؛ جمـان؛ لـڤین؛ نرڤـان ۲. کـرد و خـه‌باتێکی بـه به‌رنامـه بـۆ گه‌یشتن به ئامـانجێکی سیاسـی، کۆمه‌لایـه‌تی یان فه‌رهه‌نگی ‹جنبش ملی شدن نفت: بزووتنـه‌وه‌ی خۆمالی بوونی نه‌وت›.

**جنبشی** / combešî, conbešî/: صفت. بـزاوی؛ بزاڤی؛ جووله‌یی؛ نرڤانی ‹نیـروی جنـبشی: هێـزی بزاوی›.

**جنبنـده** / cambande, conbande ، ـها؛ ـگان/: اسم. [مجازی] جووقـه‌وار؛ مـشه‌که‌ر؛ زینـده‌وه‌ر؛ گیانـــدار؛ گیانـــه‌وه‌ر؛ گیانله‌بـــه‌ر؛ جوولــــه‌که‌ر؛ جانـه‌وه‌ر ‹در خیابـان جنبنـده‌ای دیـده نمـی‌شـد: لـه شه‌قامدا جووقه‌وارێک نه‌ده‌بینرا›.

**جنب‌وجوش** / comb-o-cûš, conb- ، ـها:/اسم. [مجازی] جم و جوول؛ گل‌وخول؛ چه‌رخ و خـول؛ هه‌لسووڕ_داسووڕ؛ جوولانه‌وه‌ی زۆر.

**جنبه** / cambe, canbe/: [عربی]/اسم. بار: ۱. [ـها/ لایه‌ن؛ تایبه‌تمه‌ندییێک له چۆنـاوچۆنی شـتێکدا ‹جنبه‌ی هنری: بـاری هونـه‌ری› ۲. [ـها/ لایـه‌ن؛ جێگای ڕوانین له شتێ ‹جنبه‌های مختلف این کـار را بررسـی کنیـد: بـاره جۆراوجۆره‌کـانی ئـه‌م کـاره لێکده‌نه‌وه› ۳. [گفتاری] خۆی هه‌لگرتن؛ ژێهاتی بۆ هه‌بوونی شتێ ‹با کسی‌که جنبه ندارد شوخی نکن: له‌گه‌ل که‌سێ که هه‌لناگرێ گه‌مه مه‌که›.

**جنبی** / cambî, canbî/: [عربی] صفت. ته‌نـشتی؛ که‌ناری: ۱. بوون له پـال یـان کـنی شـتێکه‌وه ‹مغـازه‌ی جنبـی: دووکـانی کـه‌ناری› ۲. [مجـازی] لاته‌کی؛ ناسه‌ره‌کی؛ په‌راوێزی.

**جنبیدن** / combîdan, conbîdan/: مصدر. لازم. // **جنبیدی**: جوولایـه‌وه؛ **مـی جنبـی**: ده‌جوولـیه‌وه؛ **بجنب**: بجووله‌وه// جوولانه‌وه؛ جوولان؛ جوولیان؛ جڤان؛ جمه‌ی؛ جمـای؛ له‌ڤـین؛ لـڤین؛ لـڤیان؛ لـه‌قین؛ لپـان؛ له‌خـشان؛ چـه‌لکین؛ ڤرڤـرین؛ وه‌رزین؛ وه‌رزان: ۱. جمیاین؛ له جێگه‌ی خـۆدا تـه‌کان خـواردن ‹شـاخه‌هـا مـی‌جنبیدنـد: لقـه‌کان ده‌جوولانه‌وه› ۲. بزووتن؛ نرڤـان؛ لـه‌بتین ‹یـک وجب هم از جایش نجنبیده: بستێکیش لـه جێگاکـه‌ی نه‌جوولاوه‌ته‌وه› ۳. [مجازی] کوشبوون؛ کـار یـان تێکۆشان ‹تا فرصت هست باید بجنبی: تـا ده‌رفـه‌ت هه‌یه ده‌بێ بجوولێیه‌وه› ٤. [مجـازی] په‌لـه‌کردن؛ جمایوه؛ جمـایره ‹بجنـب کـه دیـر شـد: بجوولـه‌وه دێره›.

■ صـفت فـاعلی: **جنبنـــده** (ــ)/ صـفت مفعـولی: **جنبیـــده** (جـــوولاو)/ مـصدر منفـی: **نجنبیـــدن** (نه‌جوولان)

**جنت** / cannat ، جنّات؛ جِنان/: [عربی]/اسم. [ادبی] به‌هه‌شت؛ به‌هشت؛ باغاتی خودا له‌و دونیادا.

**جنتلمن** / centelman ، ـها/: [انگلیسی] صفت. پیاوماقوول؛ ڕێزدار؛ ئاغا؛ پیاوی به‌ڕێز.

**جنـت‌مکـان** / cannatmakān/: [عربـی] صفت. به‌هه‌شتی؛ مال له به‌هه‌شت.

**جنجال** / cancāl ، ـها/:اسم. زله؛ زەنازەنا؛ قاڵ؛ سمر؛ حەمەرەمزێ؛ مەعرەکە؛ گۆمەڵ؛ حولەسێ؛ خروجز؛ گۆنگەر؛ حەلەلا؛ هەڵلا؛ هەراوهۆریا؛ هەراهەرا؛ هەراوهوولا؛ هەرەومەزات؛ هەلا_ هەلا؛ هەڵلا_ هەڵلا؛ گوڕە و هەرا؛ چەقە و گوڕە؛ چەقەوهەرا؛ چەقەچەق؛ هەلمەلە؛ گێرە ونێرە؛ جەنجاڵ؛ سنگەسنگ؛ سرمەسرم؛ هڕوگالە؛ قیرەقیر؛ مورپەمورپ؛ گوڕەگوڕ؛ قالمەقال؛ قاوقوو؛ قاوقرشیک؛ شەڕ و ئاژاوە ویڕای دەنگ و دۆر و بشێوە ‹جنجال این زن و شوهر تمامی ندارد: هەرا و هۆریای ئەم ژن و شووە نابڕێتەوە›.

▣ **جنجال به پا کردن:** هەراهەرا کردن؛ هەراوهوریا سازکردن؛ قالمەقال کردن؛ جەنجاڵ وەش کەردەی؛ ئاژاوەگێران؛ ئاژاوە نانەوە.

**جنجال آفرینی** / cancālāfarînî ، ـها/:اسم. هەڵلاخۆشکەری؛ زلەنیوەیی؛ کار یان ڕەوتی هەرا و هوریا پێکنان. هەروەها: **جنجال‌آفرین**

**جنجالی** / cancālî/: صفت. هەڵلایی؛ گۆنگەری؛ سرمەیی؛ زلەیی: ١. هۆی وەدیهاتنی ئاژاوە ‹خبرهای جنجالی: هەوالی هەڵلایی› ٢. ئاژاوەچی؛ ئاژاوەگێڕ؛ جەنجاڵی؛ خوازیاری جەنجاڵ خۆش‌کردن ‹آدم جنجالی: مرۆی ئاژاوەچی›.

**جنجر** / cancar/: [؟] ☜ **جرجَر**

**جنحه** / conhe ، ـها/: [عربی]/اسم. سووکەتاوان؛ کاری نارەوای سووکتر لە مرۆکوژی؛ ئاز و بەزی چکۆلە.

**جند** / cond ، جنود/: [معرب از فارسی]/اسم. *[ادبی]* ١. لەشکر؛ سپا ٢. لەشکری؛ کەسێ کە لە نێو لەشکردایە.

**جندبیدستر** / condebîdastar/: [معرب از کردی/ فارسی] ☜ **بیدَستر**

**جنده** / cende ، ـها/:اسم. *[گفتاری، مستهجن]* جنێ؛ جندە؛ جننە؛ جوننە؛ قەحبە؛ سۆزانی؛ ژنی خراپکار.

**جنده‌بازی** / cendebāzî/:اسم. *[گفتاری، مستهجن]* جوننە/ جوندە/ جندەبازی؛ تێکەڵی لەگەڵ ژنانی خراپکاردا. هەروەها: **جنده‌باز**

**جنده‌خانه** / cendexāne ، ـها/:اسم. *[گفتاری، مستهجن]* جوننەخانە؛ جندەخانە؛ ماڵەجندە.

**جن‌دیده** / cendîde ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. *[مجازی]* تۆقیو؛ زالەترەکیو؛ زاورچووگ؛ زەندەق‌چوو؛ زەنەق‌چووگ؛ زەنەق‌تۆقیو؛ زۆر ترساو.

**جنرال** / cen(e)rāl/: [فرانسوی] ☜ **ژنرال**

**جن‌زده** / cenzade ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[فرهنگ مردم]* جن‌پێکاو؛ جنۆکە لێداو؛ هەجننەپێکا؛ دەس لێ‌وەشاو؛ دەس لێ‌وەشیاگ؛ کەسێ کە وا دەزانرێ بە هۆی دەس پێگەیاندنی جنۆکەوە تووشی نەخۆشین هاتووە.

**جنس** / cens ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. جنس؛ چییەتی یان چۆنیەتی بنەمایی ‹جنس این طلاست: جنسی ئەمە زێڕە› ٢. بابەت؛ چین؛ جۆر؛ وێنە؛ چین و تویژ؛ گروێک کە خاوەن تایبەتمەندی هاوبەشن ‹از این جنس نمی‌خواهم: لەم بابەتەم ناوێ› ٣. جنس؛ هەر یەکە لە دوو دەستەی ژینەوەرانی نێرینە یان مێوینە ‹جنس نر؛ جنس ماده: جنسی نێر؛ جنسی مێ› ٤. *[زیست‌شناسی]* ڕەگەز؛ بەشێ لە پۆلبەندی گیانداران و گیانەوەران ٥. /اَجناس/ *[گفتاری]* کاڵا؛ پیتەوا؛ کەل‌وپەل؛ شت‌ومەک؛ ماڵ ‹جنس اعلی: کاڵای هەرەباش›.

▣ **جنس اعلا:** کاڵای هەرەباش؛ پیتەوای ڕەسەن.

**جنس جور:** کاڵای هەمە بابەت؛ پیتەوای هەمەجۆرە.

**جنس دو پا:** *[تعریض]* دەعبای دووپا؛ مرۆ؛ مرۆڤ؛ بەشەر ‹از جنس دوپا هر کاری برمی‌آید:

لـــەم دەعبـــای دووپایـــە هـــەموو کاریـــک دەوەشێتەوە›.

**جنس لطیف:** *[کنایی]* ژن؛ ژەنی؛ زە؛ بنیـادەمی مێوینە.

▣ **جنس کسی خراب بودن:** لە بنـەوە لار بـوون؛ بەدفەڕ بوون؛ بـەوجنس/ بـەدجنس/ نـاجنس بوون: **جنس کسی خرده شیشه داشتن**

**جنس کسی خردەشیشه داشتن** ☜ **جنس کسی خراب بودن**

**جنـــسی** / censî/: [عربـی] *صـفت.* ١. جنـسی؛ پێوەندیدار بە جنسەوە ٢. کالایی؛ شتومـەکی؛ پیتـــەوایی ‹کمـک جنـسی: یارمـەتی کـالایی› ٣. زایەنـدی؛ سـەر بـە پێوەنـدی ژن و شـوویی ‹رابطەی جنسی: پێوەندی زایەندی›.

**جنـسیت** / censîyyat/: [عربـی] *اسم.* چۆنیـەتی جنس بەتایبەت لە باری نێر یا مێ بوونەوە.

**جنغولـکبـازی** / canqûlakbāzî ، ـهـا/: *اسم.* *[گفتاری]* جانقولیبـازی؛ قـەرەچیبـازی؛ ئاکـاری تێکەڵ بە فڕ و فێڵ و هەرا و هۆریاوە.

**جنگ** / cang ، ـها/: *اسم.* شەڕ: ١. جەنگ؛ هیجا؛ قـی؛ هـەلا؛ هـەرف؛ تەقـە و ڕەقـە؛ چۆنیـەتی پێکدادان؛ لێکدانی دوو وڵات یان دوو هۆزی دژ بـە یـەک ‹جنـگ جهـانی: شـەڕی جیهـانی› ٢. مشتومڕ و گێرە وکێشەی نێوان دژبەران بـۆ دەس خستنی ئامانجێـک ‹جنـگ قـدرت: شـەڕی دەسـەڵات› ٣. *[مجـازی]* کێـشە و هـەرا؛ شـەڕ و شۆڕ؛ شەڕ و هەرا؛ کێشە؛ داوا؛ سواژ؛ خـڕ و جـز ‹جنگ برسر ارثیه: شەڕ لە سەر میرات›.

▣ **جنـگ اتمـی:** شـەڕی ئـەتومی؛ شـەڕێ کـە چەکی کۆکوژی ئەتومی تێدا بە کـار ببرێـت: **جنگ هستەای**

**جنـگ اعـصاب:** هـەراـ هـەرا؛ گـرم و قـاڵ؛ قێڕەقێڕ؛ زەناـ زەنا؛ ئاژاولـێ؛ کێـشمەکێش و هەراوهوریا و پێکدادانێ کە ببێتە هۆی ئازاری دەماری.

**جنگ اعلام نـشده:** شـەڕی ناخـافڵ/ کتوپـڕ؛ شەڕێ کە بێ ڕاگەیاندن دەس پێکا.

**جنـگ اقتـصادی:** شـەڕی ئـابووری؛ کـەلێن خـستنە نێـو بـار و دۆخـی ئـابووری وڵاتی دوژمنەوە.

**جنگ بین‌الملل** ☜ **جنگ جهانی**

**جنگ بیولژیکی** ☜ **جنگ میکروبی**

**جنگ پارتیزانی** ☜ **جنگ چریکی**

**جنگ تن‌بەتن:** شەڕی دەسـتەویەخە؛ شـەڕێ کە شەڕکەران بەرەورووی یەک دەبنەوە.

**جنـگ جهـانگیر** شـەڕی دنیـاگر/ جـەهانگر؛ جەنگێ کە پەڕانپەڕی جیهان دادەگرێ.

**جنـگ جهـانی:** شـەڕی جیهـانی؛ شـەڕی نێونەتەوەیی؛ جەنگێ کە زۆربەی وڵاتان پێـوە دەگلێن: **جنگ بین‌المللی**

**جنـگ چریکـی:** شـەڕی پـارتیزانی؛ لێـدە و دەرچۆ: **جنگ پارتیزانی**

**جنـــگ خـــانگی:** ١. ☜ **جنـــگ داخلـــی** ٢. ئـــاژاوەی نـــاوخۆیی؛ کێـــشمەکێش و بەربەرەکانێی نێـوان ئەنـدامانی بنەماڵـە یـان تاقمێک.

**جنگ خـروس:** کەڵەشـێر بـازی؛ کەڵەشـێرە جەنگێ/ جەنگانی؛ شەڕە کەڵـەباب؛ لێکـدانی کەڵەباب.

**جنگ داخلی:** شەڕی ناوخۆیی؛ شەڕێ نێـوان خەڵکی وڵات یان شارێک: **جنگ خانگی‐١**

**جنگ روانی:** شەڕی ڕەوانی؛ کرد و کـۆش بـۆ ورەبردنی دوژمن و گۆڕینی بیر و بۆچوونی.

**جنگ زرگری:** *[کنایی]* شەڕە درۆینـە؛ شـەڕی درۆیی بۆ فریودانی کەسانیتر.

**جنگ سرد:** *[مجـازی]* شەڕی سارد؛ شـەڕی بـە بـێچـەک؛ دژمنایـەتیکـردن بـە هـەموو دەسەڵاتەوە، بێجگە لە چەک.

**جنگ شیمیایی:** شەڕی کیمیایی؛ شـەڕێ کـە تێیدا لە چەکی کیمیایی کەڵک وەردەگرن.

**جنگ فرسایشی:** شەڕ بۆ تەزاندنی هێزی دوژمن و بەزاندنیان لە ماوەیەکی درێژخایەندا.
**جنگ قدرت:** شەڕی دەسەلات؛ شەڕ بۆ دەسکەوتنی هێز و دەسەلات.
**جنگ مرزی:** شەڕی سەر سنوور؛ شەڕەبڕە؛ شەڕێ کە لە سەر سنووردا دەقەومێ.
هەروەها: **جنگ منطقه‌ای؛ جنگ محلی**
**جنگ مغلوبه:** *[کنایی]* شەڕی قورس؛ شەڕی توند و تیژ.
**جنگ مکانیزه:** شەڕی میکانیزە؛ شەڕ بە تۆپ، دەبابە و چەکی ماشینی هەمە جۆرەوە.
**جنگ میکروبی:** شەڕی میکرۆبی؛ شەڕی بایەلۆژی؛ شەڕ بە بلاوکردنەوەی نەخۆشین لە ناو دوژمندا: **جنگ بیولژیکی**
**جنگ میهنی:** شەڕی نیشتمانی؛ شەڕێ کە بۆ پاراستنی ولات و وەدەرنانی دوژمن ئەنجام دەدرێ.
**جنگ هسته‌ای** ☜ **جنگ اتمی**
**از جنگ برگشته:** *[کنایی]* داڕزاو؛ کەلەلا؛ ورد و وێران.
**جنگ** / cong ، ـها/: *اسم*. جۆنگ: ۱. کتێبی هەمە جۆرە ۲. بەرنامەی هەمە ڕەنگە (بەرنامەی ڕادیۆ، تەلەفیزیۆن و ڕۆژنامە).
**جنگ‌آزموده** / cangāz(e)mûde ، ـها؛ ـگان/: *صفت*. شەڕدیتوو؛ بەئەزموونی جەنگی ‹لشکر جنگ‌آزموده: لەشکری شەڕدیتوو›.
**جنگ‌افروز** / cangafrûz ، ـها؛ ـان/: *صفت*. شەڕایێسێن؛ ئاگرەگەشێ؛ شەڕخۆشکەر؛ شەڕهەلگرسێن؛ شەڕئاخێز؛ ئاژاوەچی؛ جنگن؛ ئاگرەوەنەر؛ بە توانایی یان وازی شەڕ هەلایساندن: هەروەها: **جنگ‌افروزی**
**جنگ‌افزار** / cangafzār ، ـها/: *اسم*. چەکەمەنی؛ جەنگامێر؛ ئامێری شەڕ؛ هەر چەشنە کەرەسەیەک بۆ شەڕ و پێکدادان.

◙ **جنگ‌افزار اجتماعی** ☜ اسلحه‌ی اجتماعی، **اسلحه**
**جنگ‌افزار سبک** ☜ اسلحه‌ی سبک، **اسلحه**
**جنگال** / cangāl/: [؟] *اسم*. *[مخفف]* چەکی ئێلێکترۆنیکی.
**جنگاور** / cangāvar ، ـها؛ ـان/: *صفت*. شەڕڤان؛ شەڕکار؛ شەڕکەر؛ جەنگاوەر؛ جەنگەران؛ جەنگەری؛ چەکداری بەشدار لە شەڕدا.
**جنگجو**[1] / cangcû ، ـها؛ ـیان/: *اسم*. شەڕکەر؛ جەنگی؛ کەسێ کە شەڕ دەکا ‹سه جنگجو آمدند: سێ شەڕکەر هاتن›.
**جنگجو**[2]: *صفت*. شەڕواز؛ جەنگی؛ جەنگەری؛ شەڕکەر؛ بە توانا بۆ شەڕ کردن ‹مردم جنگجو: خەلکی شەڕواز›.
**جنگدیده** / cangdîde ، ـها؛ ـگان/: *صفت*. شەڕدیتوو؛ کارامە لە شەڕدا ‹افسران جنگدیده: ئەفسەرانی شەڕدیتوو›.
**جنگزده** / cangzade ، ـها؛ ـگان/: *صفت*. شەڕاژۆ؛ شەڕ لێکەوتوو؛ زیان لێکەوتوو لە شەڕ ‹مردم جنگزده در شهرهای دیگر آواره شدند: خەلکی شەڕاژۆ ئاوارەی شارەکانی‌تر بوون›.
**جنگل** / cangal ، ـها/: [سنسکریت] *اسم*. ۱. جەنگەڵ؛ لێڕ؛ لێڕەوار؛ ڕێل؛ گەبەلە؛ دارستان؛ دارسان؛ چوغور؛ چغر؛ چوغورد؛ هورمان؛ نزار؛ کێو و دەشتی داپۆشراو لە دار و دەوەن ۲. *[مجازی]* ماڵ خەرات؛ هەلشێواو؛ شپرز؛ ئەوەی لە چری یان بێ‌دوزەنەییدا هەر وەک جەنگەڵ وایە.
◙ **جنگل مولا:** *[مجازی]* ماڵ‌خەرات؛ شپرز؛ شلۆق پلۆق؛ هەلشێواو.
**جنگلبان** / cangalbān ، ـها؛ ـان/: [سنسکریت/ فارسی] *اسم*. مێشەڤان؛ مێشەوان؛ لێڕەوان؛ ڕێلڤان؛ جەنگەلوان؛ نزارەوان؛ ئاگاداری مێشە؛ کەسێ کە ئاگای لە لێڕەوارە: هەروەها: **جنگلبانی**

**جنگلداری** / cangaldārî ، ـها/: [سنسکریت/ فارسی]/اسم. مێشەڤانی؛ دارستان‌وانی؛ زانستی دانان، وەبەرهێنان، پاراستن و کەڵگری لە لێرەوار.

**جنگل‌کاری** / cangalkārî ، ـها/: [سنسکریت/ فارسی]/اسم. جەنگەڵکاری؛ لێرەوارکاری؛ کار، ڕەوت یان زانستی کێلانی داری جەنگەڵی و بەرهەم‌هێنانی دارستان.

**جنگلی** / cangalî ، ـها/: [سنسکریت] صفت. ۱. جەنگەڵی؛ لێرەواری؛ سەر بە دارستان ۲. *[کنایی]* وەحشی؛ کێفیلە؛ کێوی؛ دوور لە شارستانیەت.

**جنگنده** / cangande ، ـها؛ ـگان/: صفت. شەڕانی: ۱. خاوەن هێزی شەڕکردن ‹ماشین جنگنده: ماشێنی شەڕانی› ۲. خاوەن لێ‌هاتوویی بۆ شەڕ ‹هواپیمای جنگی: فڕۆکەی شەڕانی›.

**جنگ‌وگریز** / cang-o-gorîz ، ـها/:اسم. لێدە و دەرچۆ؛ قنگەشەڕ؛ پەلاماردان و ڕاکردن.

**جنگی**[1] / cangî/: صفت. جەنگی: ۱. شەڕانە؛ پێوەندیدار بە شەڕەوە ‹اوضاع جنگی: بار و دۆخی جەنگی› ۲. بەکار هاتوو لە شەڕدا ‹سلاح جنگی: چەکی جەنگی› ۳. شەڕانی؛ جەنگن؛ توانا لە شەڕکردندا ‹مرد جنگی: پیاوی شەڕانی›.

**جنگی**[2]: *قید*. خێرا؛ گورج؛ ئازا؛ کرژ؛ جەنگی؛ زوو؛ بە تێزە؛ فرزێ؛ بە تونێکەو؛ بە پەلە ‹جنگی برو و برگرد: خیرا برۆ و بگەڕەوە›.

**جنگیدن** / cangîdan/: مصدر. لازم. //**جنگیدی**: شەڕت‌کرد؛ **می‌جنگی**: شەڕ دەکەی؛ **بجنگ**: شەڕ بکە// ۱. شەڕکردن؛ بە شەڕ هاتن؛ لێک‌هەڵپڕژان؛ بەلشین؛ بەرزاندن؛ گژیەی؛ گژیای؛ لە شەڕ یان پێکدادانا بەشداری‌کردن ‹جنگیدن به خاطر میهن: شەڕکردن بۆ نیشتمان› ۲. خەبات‌کردن؛ ململانێ‌کردن؛ بۆ گەیشتن بە ئامانجێک لەگەل خەڵکی‌تردا بە شەڕ هاتن ‹سالها برای گرفتن حقم جنگیدم: چەنای‌چەن ساڵ بۆ گرتنی مافم خەباتم‌کرد›.

■ صفت فاعلی: **جنگنده** (شەڕکەر)/ صفت مفعولی: **جنگیده** (شەڕکردوو)/ مصدر منفی: **نجنگیدن** (شەڕ نەکردن)

**جن‌گیر** / cengîr ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. جن‌گر؛ جنەگر؛ کەسێ کە دەڵێ بە سەر جندا دەسەڵاتی هەیە و فەرمانیان پێ‌دەدا. هەروەها: **جن‌گیری**

**جنم** / canam/:اسم. *[گفتاری]* وزە؛ هاز؛ هازی؛ توانایی؛ لێهاتوویی ‹جنم این کار را ندارد: وزەی ئەم‌کارەی نیە›.

**جنوب** / cunûb, conûb, canûb/: [عربی]/اسم. ۱. باشوور؛ ژێروو؛ یەکێ لە چوار لایەنی سەرەکی؛ لایەک کە لە گاڤی نیوەڕۆژدا ڕۆژیاری لێ دەبینەدرێت؛ بەرامبەری باکوور ۲. *[کنایی]* ولاتە فەقیرەکان.

▣ **جنوب باختری** ☜ **جنوب غربی**

**جنوب خاوری** ☜ **جنوب شرقی**

**جنوب شرقی**: باشووری ڕۆژهەلاتی؛ نێوان باشوور و ڕۆژهەلات: **جنوب خاوری**

**جنوب غربی**: باشووری ڕۆژاوایی؛ نێوان باشوور و ڕۆژئاوا: **جنوب باختری**

**جنوباً** / cunûban, conûban, canûban/: [عربی] *قید*. لە باشوورەوە؛ لە لای باشوورەوە ‹جنوباً محدود است به...: لە باشوورەوە بەسراوە بە...›.

**جنوبگان** / cunûbgān, conûbgān, canûbgān/: [عربی/ فارسی]/اسم. ولاتی ڕچاوی باشووری؛ مەڵبەندانێ کە کەوتوونەتە لای ژوورووی خولگە (مەدار)ی ٦٥° ی باشووریەوە.

**جنوبی** / cunûbî, conûbî, canûbî/: [عربی] صفت. ۱. باشووری؛ پێوەندیدار یان سەر بە باشوورەوە ‹غذای جنوبی: چێشتی باشووری› ۲. هەڵکەوتوو لە لای باشووری شوێنێکەوە ‹در جنوبی دانشگاه: دەرگای باشووری زانستگا›.

**جنود** / cunûd, conûd/: [عربی] جمعِ ☜ **جُند**

**جنـون** / cunûn, conûn/: [عربی]/*اسم.* شـێتی؛ لێوەیی؛ دیلی؛ دینی؛ دێوانەیی.

▣ **جنون ادواری:** هەر یەکـە لـە نەخۆشـیگەلی ڕەوانی جۆراوجۆر کە لـە مەوداگـەلی کاتیـدا پەیتا-پەیتا خۆیان دەردەخەن.

**جنون جوانی** ☜ **اسکیزوفرنی**

**جنی** / cennî ، ـــ ها/: [عربی] *صفت.* ۱. خبـازۆ؛ جن‌پێکاو؛ دەس لێ‌وەشراو؛ دەس لـێ‌وەشـیاگ ۲. *[مجازی]* قەڵس؛ ڕکین؛ قیناوی؛ زۆر تووڕە.

**جنین** / canîn ، ـ ها/: [عربی]/*اسم. [زیست‌شناسی]* تۆڵ؛ پز؛ گۆدەک؛ پیزە؛ پێزی؛ پس؛ بەبلە؛ زایـە؛ بەر؛ بێزە؛ بار؛ لەمە؛ ساوای ناو سک؛ بوونـەوەری بربڕەدار کە هێشتا بۆ ژیان لە دەرەوەی پزدانـدا گەشەی نەکردووە.

**جنـین‌شناسـی** / canînšenāsî/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **رویان‌شناسی**

**جنینی** / canînî/: [عربی] *صفت.* تۆلی؛ پزی؛ سەر بە دەورانی پێش لەدایک‌بوون.

**جو** / cav(v)/: [عربی]/*اسم.* ۱. تەوشـک؛ کـەش؛ حەوا؛ پۆشەنێکی گـازی دەورانـدەوری تـەنێکی ئاسمانی ۲. بەرگە هەوا؛ زەپۆش؛ بەرگـەبا؛ کـژ؛ کەش؛ تەوشک؛ کۆمای هەوایەک کە پەڕانپەڕی زەوینی داگرتووە؛ ئەتموسفیر ۳. *[مجازی]* کەش؛ بـار و دۆخ؛ هەسـت و هـەوای سـەپاو بـە سـەر شوێنێکدا ‹خواستم حرف بزنم دیدم جو اصلاً بـرای حرف زدن مساعد نیست: ویستم قسە بکەم دیتم بار و دۆخ بۆ قسە کردن باش نیە›.

**جو** / cow, co: / ، ـ ها/: *اسم.* جۆ؛ جە؛ جەو؛ جوویە؛ جەهـ ؛ جـاو؛ جیـو؛ یـەوە؛ یـەو؛ یـەوی؛ ئیـو: ۱. ئالفێکی لە تیرەی گەنمە، بە لقێکی درێـژ و باریکی هلۆڵ و بڕکە-بڕکەوە، گولـەکەی هۆشـە دەکا و دەنکەکانی دڕکاویە ۲. دانەی ئەو گیایە.

▣ **جـو برهنـه:** جـۆ ڕووتـە؛ یـەوە ڕووتـە؛ بنـە گیایەکی یەکساڵەی گەنم‌ئاسا کـە بـۆ دان و کا بەرهەمی دێنن.

**جو دوسر:** کارام؛ کاران؛ گیا لەرزانە؛ جۆشاهی؛ یەوە ڕۆمی؛ یەوە دێوی؛ جۆی هوورچ.

▣ **به یک جو نیرزیدن:** *[کنایی]* هـیچ نـەهێنان؛ چڵە کایەک نەژیان؛ بێ‌نرخ بوون.

**جو**[1] / cû ، ـها/: *اسم.* جۆ؛ جۆگەلە؛ جوەلە؛ جۆک؛ جـۆگ؛ جـۆگی؛ جۆلـە؛ جـوی؛ جۆگـە؛ جۆگـا؛ بوارێکی باریک بۆ ئاو.

ـــ **جـو**[2]: *پیواژه.* ـــ خـواز؛ـــ واز؛ گـەڕ ‹جنگجو: شەڕخواز›.

**جواب** / cavāb ، ـها/: [عربی]/*اسم.* وەڵام؛ ولام؛ وەرام؛ پەرسڤ؛ جواو؛ جواب؛ جاب؛ جوال؛ پاگۆ.

▣ **جواب دندان‌شکن:** *[مجازی]* دەم‌کوت؛ نقەبڕ؛ وەرامـی بەقـەوەت لـە بەرانبـەر پەلـپ یـان هەڵمەتەوە.

**جواب دوپهلـو:** *[مجازی]* وەڵامـی دوو پاڵـوو؛ وەرامی نەڕێسات؛ وەڵامی لێڵ؛ وەڵامی وا کـە شتێکی ئاشکرای لێ دەرنەکەوێ.

**جواب سربالا:** *[مجازی]* جوابی چەوت؛ وەرامـێ کـــە نیـــشانەی وەرنـــەگرتنی ویـــستی پرسیارکەرە.

▣ **جواب دادن:** وەرام دانەوە؛ پەرسـڤ دانـەوە؛ جواب دانەوە.

**جـــواب شـــنیدن:** وەلام گـــرتن؛ بـــە تایبـــەت بیستنی وەڵامی نە لە لایەن کەسێکەوە.

**جـــواب کـــردن:** جـــواوکردن: ۱. دەرکـــردن ‹کارگرشان را جـواب کردنـد: کرێکارەکـەیان جـواو کرد› ۲. وەڵامـی نـا دانـەوە ‹دکترهـا پـدرش را جواب کردند: بژیشکەکان باوکیان جواوکرد›.

**جواب گرفتن:** وەڵام‌گرتنەوە؛ پەرسڤ گـرتن؛ جواوگرتنەوە، بە تایبەت وەڵامی ئەرێ.

**جواب گفتن:** جواوەجێ‌کردن؛ جـواو دانـەوە؛ بەرەنگاری‌کردن لە خـۆ لـە بەرانبـەر قـسە و تووڕەیی کەسێکەوە.

**جواباً** / cavāban/: [عربی] *قید.* (!) لە وەڵامدا.

**جوابـــده** / cavābdeh/: [عربـــی/ فارســـی]/*اســـم.*

وەلامدەر ‹هرجا می‌روم کسی جوابده نیست: هەرکوێ دەڕۆم کەس وەلامدەر نیە›.

**جوابگــو** / cavābgû/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. وەلامدەر؛ جواوگۆ ‹اگر چیزی گم شـد بایـد جوابگـو باشی: ئەگەر شتێک بزر بـوو دەبـێ وەلامـدەر بی›.

هەروەها: **جوابگویی**

**جوابیــه** / cavābîyye ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. وەلام‌نامە؛ جواونامە؛ ئەوەی لە وەرامی پرسـیار، داخوازی یان ڕەخنەیەکدا دەنووسرێتەوە.

**جــوار** / cavār/: [عربـی]/اسـم. ۱. جیرانیـەتی؛ جیرانـەتی؛ هاوسـایەتی؛ هامـسایی؛ هاوسـایی؛ هاوسـێیەتی؛ هاوسـێتی؛ هاوسـێیی؛ ئاوسـایی ۲. جڤار؛ نزیکی؛ نێزیکی.

▣ **در جوار**: ۱. لە هاوسایەتی ‹در جوار شما بودیم: لە هاوسایەتی ئێوەدا بووین› ۲. لە پەنا؛ لە پـاڵ؛ پاڵوو؛ لە لا؛ لە نزیک ‹در جوار خانەی خدا: لە پەنا ماڵی خوادا›.

**جـــوارح** / cavāreh/: [عربــی]/اسـم. ئــەنام؛ ئەندامگەل ‹تمام اعضاء و جوارحم درد می‌کرد: ئـازای ئەنامم ژانی ئەکرد›.

**جـواز** / cavāz ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ۱. بڕوانامـە؛ ئیجازەنامە؛ پەروانە ۲. بەرایی؛ ئیجازە.

**جواسیس** / cavāsîs/: [عربی]/[نامتداول] جمعِ ☜ **جاسوس**

**جوال** / cavāl ، ـهـا/:/اسـم. ۱. خـەراو؛ خەشـە؛ خەرتا؛ خوراک؛ گاڵە؛ گواڵـە؛ گەواڵـە؛ جەواڵـە؛ جەواڵ؛ جواڵ؛ جوهاڵ؛ چاڵ؛ هۆڕ؛ تێـری یـەک لایـی؛ کیـسەی گـەورەی لـە خـوری چنـدراو ۲. گۆنی؛ گۆنیە؛ تەلیسی گەورە.

▣ **با خرس به/ توی جوال رفـتن**:[تعـریض] ☜ **خرس**

**با کسی توی جــوال رفـتن**:[تعـریض] لەگـەڵ سـەگدا چوونـە چاڵـەوە؛ لەگـەڵ کەسـێکی نەگونجاودا هەڵکردن.

**جوالدوز** / cavāldûz ، ـها/:/اسم. شۆژن؛ شووژن؛ سووژن؛ سووزن؛ بـژوون؛ کونـدوش؛ گونـدوش؛ کندوش؛ گونووش؛ گونـۆش؛ گنـدۆش؛ گونـووژ؛ گۆچەوەن؛ گونۆژ؛ جوالدۆز؛ دەرزی زەلامی کون گەورەی بۆ دروان بە بەنی ئەستوور.

**جوالـــدوزک** / cavāldûzak ، ـهـا/:/اسـم. داردرەوش؛ داردرەوشـــە؛ کاتاڵـــپا؛ دارێکـــی گەلاپانی گوڵ سپیە بەرێکی درێژۆکەی هەیە.

**جوامع** / 'cavāme/: جمعِ ☜ **جامعه**

**جوان**[1] / cavān ، ـها؛ ـان/:/اسم. لاو؛ لاڤ؛ گـەنج؛ خورت؛ جاڵ؛ جوان؛ جەوان؛ جحێـل؛ جـەحێڵ؛ جەهاڵ؛ جێڵ ‹جوانی آمده بود، تـو را مـی‌خواسـت: لاوێک هاتبوو، تۆی دەویست›.

▣ **جوان اعرابی**:[ادبی] لاو؛ لاڤ؛ کوڕی گەنجێ کە پێگەیشتووە.

**جوان**[2]: صفت. ۱. گـەنج؛ جحـێڵ؛ لاو؛ خـاوەنی گـــەنجی ‹زن جـــوان: ژنی گـــەنج› ۲.[کنـــایی] گەشـەدار؛ پـەژ؛ بـە گەشـە ‹فکـر جـوان: هـزری گەشەدار› ۳.[کنـایی] کاڵ؛ جحێڵ؛ کەم‌ئەزموون؛ هەرزەکار؛ جهاڵ؛ نووچە ‹هنوز جوان است و سـرش باد دارد: هێشتا کاڵە و کەللەی تەمی هەیە›.

▣ **جوان شدن**: جـوان بوونـەوە؛ بـە تـین و تـاو بوونەوە؛ بە خۆدا هاتنەوە.

**جوان مانـدن**: گـەنج مانـەوە؛ بـە تـین و تـاو مانەوە.

**جوانانه**[1] / cavānāne/: صفت. جحێلانـە؛ لاوانـە؛ گەنجانە؛ جوانانە؛ وەکوو جوانـان ‹لبـاس جوانانـە: جل و بەرگی جحێلانە›.

**جوانانه**[2]: قید. لاوانـە؛ گەنجانـە؛ جوانانـە؛ وەک جحێلان؛ بە شێواز و کردەوەی جوانان ‹با قامت خمیدە جوانانە زیستن: بە پشتی چەماوە لاوانە ژیان›.

**جوانب** / cavāneb/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **جانب** ۲. بار؛ لایەن؛ دەوروبەر.

**جوانبخــت** / cavānbaxt/: صـفت. بەختــەوەر؛ بەختیار؛ خۆشبەخت ‹جوانبختِ جهانم گرچـە پیـرم: بەختەوەری جەهانم گەرچی پیرم›.

**جوانــک** / cavānak ، ـها/:اسم. ۱. کــوڕیژە؛ کوڕیژگە؛ لاوکۆ؛ کوڕلە ۲. [کنایی] مرۆی هێشتا پێنەگەیشتووی خۆ بە شتزان.

**جوانمرد** / cavānmard ، ـها؛ ـان/: صفت. جوامێر؛ جــامێر؛ جۆمــەرد؛ شــەجۆ؛ دلاوا؛ شــامبۆز؛ مەردەمێر؛ پیاوخاس؛ مێرخاس؛ مەرد و ڕەند (بە هێما)؛ بە ئاکار و گەدی چاکەوە (وەک بەخــشین، دەستگری لە هەژاران، ئازایی و لێبوردوویی).

**جوانمرگ** / cavānmarg/: صفت. جوانەمــەرگ؛ چەلەپەر؛ دۆخی کەسێ کە بە جوانی مردبێ.

**جوانه** / cavāne ، ـها/:اسم. [گیاەشناسی] چـرۆ؛ چووز؛ چــووزە؛ چووزەلــە؛ چــووزەرە؛ چەکــەرە؛ چەکەری؛ چەقەرە؛ چقیرە؛ جیــک؛ جیــق؛ وەچ؛ خاوە؛ خەلف؛ توول؛ تووز؛ ڕوز؛ شینە؛ سنوورچە؛ پل؛ پاپل؛ گۆپیتە؛ لک؛ لق؛ لزگ؛ لکــی ناســکی دار و گیا کە تازە لە بن لقەوە سەر هەڵدا.

◘ **جوانەی چشایی**: [کالبدشناسی] پرزی زمان؛ ئەو بەشە لە زمان کە تامی پێ دەناسرێ.

◘ **جوانه زدن**: ۱. دندووکە دان؛ چەکــەرە دان؛ چەکەرە دەرکردن؛ چکرە داین؛ جیک دایــن؛ چقیرە بەســاین؛ جیــق ئــەلاوردن؛ چـرۆ دان؛ چرۆ دەرکردن؛ خامێ بەرکەردەی ۲. [مجازی] سەر هەڵدان؛ سەوز بوون؛ سەر دەرهێنان.

**جوانی** / cavānî ، ـ ها/:اسم. لاوەتی؛ گەنجیەتی: ۱. قۆناغێک لە گەشەکردن و گۆورانی ژینــەوەر، پاش لە دایک بوون و نژمگری، بەتایبەت قۆناغی دوای تازەلاوی و پێش لە پێگەیشتن ۲. قۆناغی دوای منداڵــی و پــێش لــە مــامناوەنــدی ۳. [جامعــەشناســی] ســالانی نێــوان ۱۸ تــا ۲۵ی تەمەن ٤. [مجازی] منداڵی؛ کرچ و کاڵی؛ ئاکاری بە بێ ورد بوونەوە ‹جوانی نکن! دست از ایــن کارهــا بردار: منداڵی مەکە! لــەم کارانــە دەســت هەڵــگرە› ٥. چۆنیەتی لاو بــوون ‹جــوانی اســت و هــزار آرزو: لاوەتیە و ئاواتی زۆر›.

**جــواهر** / cavāher ، ــ هــا؛ ـات/: [عربــی] اسم. جــــواهێر؛ جــــوایر؛ جــــەواهێرات؛ بلــــەخش؛ گەوهەران؛ هەر یەکە لــەو بەردەگرانانــە کــە بــۆ جوانکاری دەکار دەچن.

**جواهرســاز** / cavāhersāz ، ـها؛ ـان/: [عربــی/ فارسی] اسم. گەوهەرکار؛ جەواهێرساز. هــەروەها: **جواهرفروش**

**جواهرســازی** / cavāhersāzî/: [عربــی/ فارســی] اســـم. گەوهــــــەرکاری؛ جەواهێرســــــازی: ۱. گەوهەرسازی؛ پیشەی جەواهێرساز ۲. ـها/ کاری دروست کــردنی جــەواهێرات. هــەروەها: **جواهرفروشی**

**جواهرنــشان** / cavāhernešān/: [عربــی/ فارســی] صفت. گەوهەرنیشان؛ بە بەردی گران بە سەرەوە داندراو ‹شمشیر گوهرنشان: شیری گەوهەرنیشان›.

**جــــواهری** / cavāherî ، ـهــا/: [عربــی] اســم. ۱. گەوهەرساز ۲. گەوهەرفرۆش.

**جوایز** / cavāyez/: [عربی] جمعِ ☜ **جایزه**

**ـجوئی** / cû'î/ ☜ **ـجویی**

**جوب** / cûb/:اسم. [گفتاری] جۆگە؛ جۆلە؛ جــوو؛ جۆی؛ جۆکلێ؛ دێــراو؛ شــوێنی باریکــەئاو پێــدا ڕۆیشتن.

**جوـجو** / cûcû ، ـها/:اسم. [کودکانــه] ۱. ججــوو؛ چۆلەکە یان پەلەوەری بچکۆلانــە ۲. جووچــک؛ جووجەلە؛ جوجیلە؛ چێلی ۳. مێــروو؛ گــەناوەر؛ گــەناور؛ جــڕ و جانــەوەر؛ دەعبــا؛ زەنــدی؛ جانەوەری وردیلە؛ حەشەرە.

**جوجــه** / cûce ، ـها؛ ـگـان/:اســم. جووجەڵــە؛ جووجەڵــێ؛ جووجیلــە؛ جووچکــە؛ جووچــک؛ جیچــــک؛ جووجــــک؛ چیچــــک؛ چووچــــک؛ چیچەڵۆک؛ جیجە؛ جیجک؛ چیچ؛ چیچە؛ چێل؛ چێلــی؛ چیــک؛ جۆلــک؛ ســێخپــەڕ؛ ســێزواڵ؛ سوورەساقە؛ سوورەســەقەتە؛ زڤــان؛ بەچکــەی پەلەوەران، بەتایبەت بێچووی مریشکی لینی.

◘ **جوجەی ماشینی**: جووجەڵەی ماشینی.

**جوجــه تیغــی** / cûcetîqî ، ـهــا/:اسم. ژیــشک؛

ژووشــــک؛ ژووزک؛ ژویـــژوی؛ ژڤــژی؛ ژووژوو؛ ژووژی؛ ژژوو؛ ژیرکـــه؛ کولـــه؛ چولـــه؛ چوولـــه؛ جانەوەرێکی چکۆلە بە پێستێکی دڕکاویەوە.

**جوجەخروس** / cûcexurûs, -xorûs ، ـ ها/:اسم. ۱. جووجەڵــەی نێرینــەی مریــشک (کەڵەشـێرە وارۆک) ۲. *[تعریض]* جورە؛ لاوی کەم تەمەن.

**جوجه فكلی** / cûcefokolî ، ـ ها/:اسم. *[تعریض]* فرووج؛ لاوی تازە پێگەیشتووی خۆ جوانکەر.

**جوجه کشی** / cûcekešî ، ـ ها/:اسم. کـار یـان ڕەوتی هێلکە هەڵێنان بە ئامرازی ماشینی.

**جوخه** / cûxe ، ـ ها/: [ترکی]/اسم. جووخە؛ جووقە؛ چووکترین یەکەی چەکداری، بریتی لە ۸ کەس.

⊡ **جوخەی آتش**: جووخــەی دەســت کردنــەوە؛ جووخەیەک کە بەڕێوەبەری تـیر هاویـشتنە.

هەروەها: **جوخەی اعدام**

**جوخــەی مــرگ**: ۱. جووخـــەی مـــەرگ؛ جووخەیـــەک کـــە بەڕێوەبـــەری کوشـــتنی نـــەیارانی سیاســـیە ۲. جووخـــەی کـــاری پـــڕ مەترسی.

**جود** / cûd/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* چاکـە؛ خاسـی؛ بەخشش.

**جودانه** / cowdāne, co:- ، ـ ها/:اسم. ۱. بیرکوڵ؛ میتۆر؛ جۆرێک دارەبی کـە چێوەکـەی ئەکەنـە دەستەی پێمەڕە و قولنگ ۲. جـۆرە چنینێکـی کامواییە.

**جـودو** / cûdo, codo/: [انگلیسی از ژاپنـی]/اسم. جودۆ؛ جۆرێک زۆرەبانێ بۆ خۆ پاراستنە کـە لـە ڕۆژهەڵاتی دوورەوە هاتووە.

**جودوکـــار** / cûdokār, codo- ، ـــ هـا؛ ـان/: [انگلیسی/ فارسی]/اسم. جودۆکـار؛ کەسـێ کـە لـە وەرزەشی جودۆدا کارامەیە.

**جور** / cowr, co:r/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* سـتەم؛ گووج؛ لەتم؛ زۆرکاری؛ زوڵم؛ ناهەقی؛ ئەغز.

⊡ **جور کسی/ چیزی را کشیدن**: کـردەی مـن و بردەی با بوون؛ بـاری کەسـێ یـان شـتێ بـە ئەستۆگرتن؛ کـاری کەسـێ جێبـەجێ کـردن ‹آزاد کە پول نداشت، جور او را هم کشیدم: ئازاد خـۆ پارەی نەبوو، کردەی من و بردە ی با›.

**جـور**[1] / cûr ، ـهـا/:اسـم. ۱. *[گفتـاری]* چەشــن؛ شێوە؛ جۆر؛ وێنـە؛ گـۆر؛ گۆنـە؛ شـێوە؛ شـێواز؛ ڕەوشت ‹باید این جور گره بزنی: ئـەبێ بـەم چەشـنە گرێی بدەی› ۲. *[گفتاری]* جۆر؛ چەشن؛ چینێ لە شتانی وەک یەک ‹ما از این جور چیزها نمی‌خوریم: ئێمە لەم جۆرە شتانە نـاخۆین› ۳. *[زیستشناسـی]* یەکەیەکی ڕیزبەندی ڕوەک و گیانەوەر.

**جـور**[2]: صفت. *[گفتـاری]* جـۆر؛ سـاز: ۱. بـاش؛ ڕێکوپێک؛ تەکووز؛ بە مرێسەوە ‹اوضاع جور است: بار و دۆخەکە جورە› ۲. تەبا؛ جووت ‹آزاد و آرام بـا هم جورند: ئازاد و ئارام پێکەوە جۆرن›.

⊡ **جور بودن**: جۆر بـوون؛ تـەبا بـوون؛ سـازگار بوون.

**جور درآمدن**: ڕێککەوتن؛ ڕێک دەرهاتن.

**جـور شـدن**: جـۆر بـوون: ۱. ڕێـک هـاتن؛ ڕێـک کـەوتن؛ تـەکووز بـوون؛ مـرێس بـوون ‹برنامەی کارم جور شد: بەرنامـەی کارەکـەم جـۆر بوو› ۲. ڕەخسان؛ دابین بوون؛ بەرهەڤ بوون؛ گیف بوون ‹وسیلەی مسافرت جور شد: کەرستەی سەفەر جۆر بوو›. هەروەها: **جور کردن**

**جوراب** / cûrāb ، ـهـا/:اسم. گۆرەوێ؛ گـۆرەوی؛ گـۆروا؛ گـۆرە؛ گـۆراو؛ گۆریـە؛ گـوورە؛ گوریـا؛ گـورمی؛ جـۆراو؛ جـووراو؛ جـۆراب؛ کـورک؛ پۆشەنێکی چندراوە کە دە پا دەکرێ و لانی‌کەم لە پەنجەوە هەتا ژوور قاپوولە دادەپۆشێ.

**جوراب شـلواری** / cûrābšalvārî ، ـ هـا/:اسم. گۆرەوێ شواڵی؛ گۆروایەک کە لەگەڵ شواڵێکی هەر لەو جنسە چنراون و پێکەوە لکاون.

**جورواجـــور** / cûrvācûr/: صــفت. *[گفتـــاری]* جۆراوجـۆر؛ جۆرواجـۆر؛ جۆربـەجۆر ‹آدمهـای جوراجـور بـە آنجـا رفـت و آمـد مـی‌کردنـد: کەسـانی جۆراوجۆر ئامشۆی ئەوێیان دەکرد›.

**جــوری** / cûrî/: *اسم. [گفتاری]* جۆری؛ ڕێکی؛ سازی؛ دۆخ یان چۆنیەتی جۆر بوون ‹برای جوری جنس این را هم خریدم: بۆ جۆری کەلپەل، ئەمەشم سەند›.

**جوریـدن** / cûrîdan/: *مصدر. [گفتاری]* دۆزیـن؛ پشکنین ‹مادرم شیشهای سرش را میجورید: دایکم سپێکانی سەری ئەدۆزی›.

**جوز** / cowz, co:z ، ـها/: [معرب از کردی]/*اسم.* گەوز؛ گیز؛ گۆیزۆکە؛ هـەر میوەیـەک کـە دوای پێگەیشتن کاکڵەکەی لە نێـو توێکـڵێکی ئەستوور و سەختدایە (وەک گوێز، فنۆق، نارگیل).

▣ **جوز بویا:** دەنکـی بۆنخۆشـی داری سـەوزی جۆزا کە لە بژیشکیدا بە کار دەڕوا.

**جوز جادو:** بنچک یان دەوەنی خەزەڵـکەری ناوچەی ئامریکا.

**جــوز قنـد:** قەیـسی یـان هەشتاڵـووکوتی لـە کاکڵە و خاکە قەند و شتانیتر ئاخنراو.

**جوز هنـدی:** جـۆرە دارێکـە بەرەکـەی وەک بەهارات کەڵکی لێوەردەگرن.

**جــوزا** / cowzā, co:zā/: [عربـی]/*اسم.* ١. ☜ **دوپیکـر** ٢. *[قـدیمی]* سـێیەمین بـرج لـە دوازدە برجی سـاڵ، بەرانبـەر بـە جـۆزەردان ٣. *ـ/ـها/* دارێکە بەرەکەی لە دەواسازیدا بەکار دەڕوا.

**جــــوزی**[1] / cowzî, co:zî/: [معـــرب]/*اســـم.* کەمکۆڵـی؛ ڕەنگـی کـەمکۆڵ؛ بەنەوشـی ئامـاڵ سپی؛ بەنەوشی کاڵ.

**جوزی**[2] / ـ ـها/: *صفت.* کەمکۆڵـی؛ بـە ڕەنگـی بەنەوشی کاڵ.

**جوسازی** / cavsāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کار یان ڕەوتی بەدیهێنانی بار و دۆخێکی شـیاو بـۆ کارتێکردن بـە سـەر خەڵـکی کۆمەڵـگایەکدا و گەیشتن بە ئامانجێکی (زۆرتر) ناڕەوا.

**جوش**[1] / cûš/: *اسم.* جۆش: ١. *ـ/ ـها/* جوانـەزوە؛ عـازەوی؛ زیپکـە؛ پیزۆکـە؛ چینچـک؛ ژەرەک؛ پرسک؛ دەشـپووک؛ وردیلە هەڵـتۆقاوی ڕووی پێست ‹جوش صورت: جۆشی ڕوومـەت› ٢. *ـ/ـها/* تۆقلە؛ بلۆق؛ بۆشاییەک کە بە هۆی بلقی هەواوە لە تراوێکدا بەدی دێ ٣. ماکێک کـە لـە کـاتی توانەوەدا، گازی لـێ دەردەچـێ ‹جـوش شیرین: جۆشی شیرین› ٤. کـوڵ؛ کـەڵ؛ هـوف؛ هـووف؛ ڕەوتی جۆشان ‹سماور جوش آمد: سەماوەرەکە هاتە کـوڵ› ٥. *[گفتـاری]* کـار و ڕەوتی هەڵـچۆقین؛ هەڵچوون ‹چرا این قـدر جـوش مـیزنـی: بـۆ ئەنـدە هەڵدەچۆقی؟› ٦. *ـ/ها/* پەیوەنـد؛ پێوەنـد؛ ڕەوتی لکان ٧. جۆشکاری.

▣ **جوش شیرین:** جۆشـی شـیرین؛ گـەردێکی سپیە، لە ئـاودا دەتوێتـەوە و دژی ئەسـیدە و کەڵکی داروویی زۆری هەیە.

**جوش صورت:** جۆش؛ زیپکـە؛ زیپـک؛ زپـک؛ زپرکـــە؛ پرســـک؛ زفتـــک؛ زەک؛ جوانـــک؛ زیپکەی عازەوی کە لە ڕووی تازەلاواندا پەیدا دەبێ: **جوش غرور**

**جوش غرور** ☜ **جوش صورت**

▣ **جـــوش خـــوردن:** ١. *[پزشـــکی]* لکانـــەوە؛ گۆشـــتەوزوون هێنانـــەوە (بـــۆ زام)؛ خـــووز هێنانەوە (بۆ ئێسکی شکاو) ٢. *[مکانیک]* لکـان؛ دالکـان؛ چەسـپان و پێکـەوە نووسـانی دوو پارچە لـە ئامرازێـک ٣. *[گفتـاری]* سـەرگرتن؛ جێبەجێ بوون؛ بـەڕێوە چـوونی کارێـک ‹تـا معامله جـوش خـورد پـدرمان درآمـد!: تـا مامەڵـەکە سـەری گـرت قـیر سـپی بـوو!› ٤. *[گفتـاری]* هەڵچۆقان؛ لە بەر تووڕەیی، پیش خواردنـەوە و سـوور هەڵـگەڕان ‹کـم جـوش بخـور! قـاطی میکنی: کەم هەڵچۆقێ! لێوە دەبێ›.

**جوش خوردن معامله:** *[مجازی]* ڕێـک هـاتن؛ وێکهاتن؛ سـەرگرتنی سـەودا؛ جـۆر بـوونی مامەڵە ‹آخرش معاملەشان جوش خورد: ئـاخری سەوداکەیان سەری گرت›.

**جـــوش دادن:** ١. ئاویـــە دان؛ جـــۆش دان؛ لەحیمکردن ٢. *[کنایی]* یـەک خـستن؛ نێـوان

خــۆش کــردن ‹عاقبت میانـه‌شـان را جـوش داد: ئاخری تیکی خستنه‌وه›.

**جوش زدن:** ۱. *[مجازی]* هه‌ڵهاتن؛ هه‌ڵـچوون؛ هاتنه کەف و کـوڵ؛ هۆرئامـه‌ی ‹خیلـی جـوش مـی‌زد: زۆر هه‌ڵـده‌هات› ۲. زیپکــه ده‌ردان؛ زیپکــه‌دان؛ زه‌کـێ زنیــه‌ی؛ جــۆش‌کــردن ‹تخم‌مرغ بخورم تنم جوش مـی‌زنـد: هێلکـه بخـۆم زیپکه ده‌ردینم›.

**جوش**[۲]: *صفت. [گفتاری]* لـه کـوڵ؛ بـه کـوڵ؛ لـه حالی کوڵاندا.

⊡ **جــوش آمــدن:** هاتنــه‌کوڵ؛ وه‌کــوڵ هــاتن؛ کــوڵان؛ کوڵــیان؛ کوڵــین؛ کــه‌لان؛ کــه‌لین؛ قوڵین؛ که‌لهاتن؛ جۆشان؛ جۆشـیان؛ جـۆش هاتن؛ ئامه‌یوه قوڵێ؛ په‌یدا بـوونی بـڵقی گـاز یان هه‌ڵم لـه ڕووی تـراودا، بـه هـۆی تـینی زۆره‌وه ‹آب جوش امد: ئاوه‌که هاته کوڵ›.

**جوش آوردن:** ۱. هێنانه‌کوڵ؛ وه‌کوڵ هێنـان؛ ئارده‌یوه قوڵێ؛ کوڵاندن؛ که‌لانـدن؛ گرینـه‌ی ‹آب را جــوش آورد: ئاوه‌کــه‌ی هێنایــه کــوڵ› ۲. *[مجـازی]* هه‌ڵـچوون؛ هه‌ڵـپفان؛ ئامـه‌یوه مه‌لێ؛ تووڕه بوون ‹وقتی این حـرف را زدم، یکهـو جوش آورد و دادش بلند شد: کاتێ ئه‌م قسه‌یه‌م‌کرد، له‌ناکاو هه‌ڵچوو و هاواری به‌رزه‌وه بوو›.

**جوش بودن:** کوڵ بوون؛ له کوڵدا بوون؛ قوڵێ ده‌ی؛ قوڵــێ شــانه‌ی ‹آب جـوش اسـت: ئاوه‌کـه کوڵه›.

**-جوش**[۳]: *پیـواژه.* ۱. ـــ جــۆش؛ ـ کــوڵ؛ ـ کــه‌ڵ ‹دیرجـــوش؛ زود جـــوش: دێرکـــوڵ؛ زووکـــوڵ› ۲. ـکوڵێن؛ کوڵێنه‌ر ‹قهوه‌جوش: قاوه‌کوڵێن›.

**جوشان** / cûšān/: *صفت.* له کوڵ؛ بـه کـوڵ؛ لـه جــۆش؛ جۆشــان؛ هه‌ڵــقوڵ ‹چـشمه‌ی جوشـان: چاوکه‌ی له کوڵ›.

⊡ **قرص جوشان:** حه‌بی جۆشان.

**جوشــــاندن** / cûšāndan/: *مـــصدر. متعـــدی.* //**جوشاندی:** کوڵانـدت؛ **مـی جوشـانی:** ده‌کوڵـێنی؛ **بجوشـــان:** بکوڵــێنه// ۱. کوڵانــدن؛ که‌لانــدن؛ جوشانن؛ گرینه‌ی؛ گرینـای ۲. شـتێ ده ئـاوی کوڵدا دانان (وه‌ک بـۆ پاکـه‌و بـوون یـان کـوژرانی میکرۆب). هه‌روه‌ها: **جوشاندنی**

■ صـفت فـاعلی: **جوشــاننده** (کوڵـێنه‌ر)/ صـفت مفعـولی: **جوشــانده** (کوڵـێنراو)/ مـصدر منفـی: **نَجوشاندن** (نه‌کوڵاندن)

**جوشـــانده** / cûšānde/: *اســم.* کوڵـــێندراو و پاڵێوراوی گیای ده‌رمانی که ده‌یخۆن.

**جوشــسنگ** / cûššāng ، ـهـا/: *اسـم.* بـه‌ردی پێکهاتوو له زۆرێک کوڵوسه به‌رد که به قورێکی وشکه‌وه بوو پێکه‌وه نووساون: **کُنگِلُومِرا**

**جوشش** / cûšeš/: *اسم.* ۱. *[ادبی]* کـوڵ؛ جـۆش؛ کار یـان ڕه‌وتی کوڵـیان ۲. *[کنایی]* هـاوده‌نگی؛ هۆگره‌تی؛ کار یان ڕه‌وتی تێکه‌ڵ بوون و شێلیان له‌گه‌ڵ خه‌ڵکدا ‹با کسی جوشش نـدارد: هـاوده‌نگی که‌س ناکات›.

**جوشـکار** / cûškār ، ـهـا؛ ـان/: *اسـم.* جۆشـکار؛ که‌سێ که کاری جۆشکاریه.

**جوشــــکاری** / cûškārî/: *اســـم.* جۆشـــکاری: ۱. کاری پێکه‌وه لکاندنی دوو پارچـه‌ی کـانزایی بــه داخ کردنیــان تــا ڕاده‌یــه‌ک کــه بتاونــه‌وه و پێکه‌وه بنووسن ۲. کارگه‌ی جۆشکاری.

**جوشــگاه** / cûšgāh ، ـهـا/: *اسـم.* ۱. ڕه‌قێـڵه؛ ڕه‌قێنه؛ وشکه؛ به‌شـێ لـه پێـست کـه لـه بـه‌ر برینداربوون، تاوه‌نگازی یان هـه‌ر هـۆیێکی‌تـر، نـه‌رمی و ڕه‌نگـی سروشـتی نـه‌ماوه و وشـک و سفت بۆته‌وه و قه‌ڵشاوه ۲. جۆشگه؛ فتروونه (لـه داردا)؛ شوێن و خالی جۆشدانی دوو یـان چـه‌ن شت پێکه‌وه.

**جوشــن** / cowšan, co:šan ، ـهـا/: [عربـی]/*اسم.* ۱. زره؛ زرێ؛ زری و کومزری ۲. ئارمیچر.

**جوش‌وجلا** / cûš-o-calā/: [فارسـی/ عربـی]/*اسـم.* *[گفتـاری]* پـه‌ل‌وپـۆ؛ کردوکـۆش؛ تێکۆشـان و ته‌پشتی بـه نیگه‌رانیـه‌وه ‹بـرای قبولی پسرش او

بیشتر جوش و جلا می‌زد: بۆ قەبووڵ بوونی کوڕەکەی ئەو زۆرتر پەلوپۆی دەکرد›.

**جوش‌وخروش** / cûš-o-xurûš, -xorûš/: *اسم. [ادبی]* خڕ و جز؛ هەرا و هوریا؛ خرۆش؛ کێشە و هەرای لە سەر پێچکاری و بەرهەڵستی ‹جوش و خروش مردم هر لحظه بیشتر می‌شد: خڕ و جزی خەڵک تاوبەتاو تەشەنەی دەکرد›.

**جوشی** / cûšî/: *صفت. [گفتاری]* تووڕە؛ ڕکین ‹او زود جوشی می‌شود: ئەو زوو تووڕە دەبێ›.

هەروەها: **جوشی شدن**

**جوشیدن** / cûšîdan/: *مصدر. لازم.* // **جوشیدی:** کولای؛ **می جوشی:** دەکولی؛ **بجوش:** بکولە// کولان؛ کولین؛ کەلین؛ گریەی؛ گریای: ۱. گەیشتن بە خاڵی کولان ‹جوشیدن آب: کولانی ئاو› ۲. هاتنەکوڵ؛ پەیدا بوونی بڵقی گاز یان هەڵم بە ڕووی تراوێکدا ۳. هەڵقولان؛ هەڵقولین؛ جۆشیان؛ جۆشین؛ زانەوە؛ قەمزتن؛ هۆڕتەقەی؛ دەرکەوتن لە قووڵایی شتێکەوە ‹جوشیدن چشمه: هەڵقولانی چاوکە› ٤. *[مجازی]* جۆشان؛ شێلیان؛ کولان؛ تێکەڵ بوون؛ دۆستی و هاونشینی کردن ‹با مردم جوشیدن: لەگەڵ خەڵکیدا جۆشان›.

هەروەها: **جوشیدنی**

■ صفت فاعلی: **جوشنده** (ـــ)/ صفت مفعولی: **جوشیده** (کولاو)/ مصدر منفی: **نَجوشیدن** (نەکولان)

**جوع** / cû'/: [عربی] *اسم. [ادبی]* برسیەتی؛ برچێتی؛ ئاوراییێ.

**جوف** / cowfe, co:fe/: [عربی] *حرف. [ادبی]* ناو؛ نێو؛ دلێو؛ تۆ؛ توێ؛ لە ناخ یان بنیاڵدا.

⊡ **در جوف پاکت:** دە نێو پاکەت.

**در جوف لباس:** لە ناو جل و بەرگ.

**جوقه** / cûqe، ـها/: [ترکی] *اسم. [گفتاری]* ۱. جووخە ۲. جۆق؛ پۆل؛ پەل؛ گەل؛ کۆمەڵ؛ دەستە؛ دەسە؛ تاقم؛ چین (بەتایبەت لە خەڵک).

**جوک** / cok، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* جەفەنگ؛ حەنەک؛ نوکتە؛ لەتیفە؛ جوک.

**جوکی** / cûkî، ـها؛ ـان/: [سنسکریت] *اسم.* مورتاز؛ برێ لە پیاوانی تەرکەدنیای هیندوو.

**جوگندمی** / cowgandomî, co:-/: *صفت.* ڕەش‌ئەسمەر؛ ڕەش و سپی؛ ڕەش و چەرموو؛ برنجی؛ ماش و برنجی؛ چیل-چیل؛ پۆش؛ سیا و چەرمەیی تێکەڵ (بەتایبەت بۆ مووی سەر).

**جولا** / cûlā، ـها؛ ـیان/: *اسم. [قدیمی]* جۆلا؛ جۆلایی؛ خانووت؛ حێک؛ بوزوتەن؛ کۆڕسکەر؛ شاڵباف: **جولاه**

**جولان** / cowlān, co:lān/: [عربی] *اسم.* ۱. کار و ڕەوتی تەراتێن؛ لینگاردن؛ غاردان ۲. خۆنوێنی؛ جەولان؛ کار یان ڕەوتی چوونە ئەملا و ئەولاوە بۆ خۆ نواندن ‹سرش را ژل زده بود و در خیابان جولان می‌داد: قژی فڕ دابوو، لە نێو شەقاماندا خۆی دەنواند›. هەروەها: **جولان دادن**

**جولانگاه** / cowlāngāh, co:lān-، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* لنگارگە؛ غارگە؛ شوێنێ کە تێیدا تەراتێن دەکرێت ‹کوچه‌ی ما شده بود جولانگاه آدمهای ناجور: کۆڵانەکەی ئێمە ببوە لنگارگەی برێ لۆتی-پۆتی›.

**جولاه** / cûlāh/ ☜ **جولا**

**جولای** / cûlāy/: [انگلیسی] ☜ **ژوئیه**

**جون** / cûn/: [؟] ☜ **ژوئن**

**جونده** / canande، ـها؛ ـگان/: *صفت.* خورۆک؛ کرتێن؛ کرینک؛ کرێنەر؛ داکرۆژەر: ۱. بە تایبەتمەندی یان توانایی کرتاندن و جاوینەوە ۲. سەر بە دەستەیەک لە گیانەوەرانی وەک: مشک و کەرویشک.

**جوهر** / cowhar, co:har/: [معرب از فارسی] *اسم.* جەوهەر: ۱. دانستەی تایبەت و پێداویستی شتێ کە دەبێتە هۆی ناسین و ناسینەوەی ئەو شتە ۲. سەرەکی‌ترین و بنەمایی‌ترین توخمی پێکهێنەری شتێک ۳. ئاوی خەستەوە کراوی هەر شتێک ٤. هەر ماکێکی ڕەنگی پیشەکاری کە لە ڕەنگرێژی یان خواردەمەنیدا بە کار دەڕوا

۵. *[گفتاری]* لێهاتوویی؛ ژێهاتی.

▣ **جوهر آبی**: جەوهەری ئاوی؛ تراوێکە بۆ نووسین بە ڕەنگی کەوە. هەروەها: **جوهر بنفش؛ جوهر قرمز؛ جوهر مشکی** ...

**جوهر آفتاب‌گردان** ☜ **تُورنُسل**

**جوهر سرکە**: ترشی سرکە؛ ئەسیدی بەدیهاتوو لە ترش بوونی ترێ.

**جوهر سقز** ☜ **تِربانتین**

**جوهر شراب** ☜ **اِتانُل**

**جوهر شورە**: ئەسید نیتریک؛ ترشێکی بێڕەنگ و توندە کە لەگەڵ ئاو تێکەڵ دەبێ و زۆربەی کانزاکان دەتوێنێتەوە.

**جوهرگوگرد**: ئەسید سوولفووریک؛ تراوێکی بێڕەنگی هێندێک خەست و یەکجار بەقەوەتە بۆ تواندنەوەی کانزا و زۆر ماکی‌تر، کە لە پیشەسازیدا زۆر بەکار دەچێ.

**جوهر لیمو**: ئەسید سیتریک؛ ماکێکی بلووری بێڕەنگ یان سپی کە لە لیمۆی ترش و بڕێ میوەی ترشی‌تردا هەیە.

**جوهر مازو** ☜ **تانَن**

**جوهر مورچە**: ئەسید فورمیک؛ ترشێکی بێڕەنگە کە لە لەشی مێروولەدایە و بۆنێکی توندی هەیە.

**جوهر نُشادر** ☜ **آمونیاک**

**جوهر نمک**: ئەسیدکولۆریدریک؛ تراوێکی بێ ڕەنگی زۆر بەقەوەت بۆ تاواندنەوەی کانزا و زۆر ماکی‌ترە کە لە گەدەی مرۆشدا هەیە.

▣ **جوهر کاری را داشتن**: گوردی کاری هەبوون؛ خاوەن هێز یان لێهاتوویی پێویست بۆ کارێ.

**جوهرگین** / cowhargîn, co:har- /: [معرب/ فارسی] *اسم.* باسمە؛ جێ جەوهەری مۆر.

**جوهری** / cowharî, co:harî /: [عربی] *صفت.* جەوهەری: ۱. جەوهەراوی؛ بە جەوهەرەوە تلاو ‹دستم جوهری شد: دەستم جەوهەری بوو› ۲. بە جەوهەر ‹رنگهای جوهری: ڕەنگەلی جەوهەری›.

**جوی** / cavvî /: [عربی] *صفت.* کەشی؛ هەوایی؛ پێوەندیدار بە تەوشکەوە ‹باریدن برف و باران از رویدادهای جوی است: بارینی بەفر و باران لە ڕووداوگەلی کەشیە›.

**جوی** / cûy ، ـها /: *اسم. [ادبی]* جۆ؛ جۆگەلە؛ جۆگە؛ جۆبار؛ جۆی؛ جۆلە؛ جوو؛ جۆکلێ؛ جۆف؛ جەمۆک؛ جان؛ باریکە هێڵی بوارگەی ئاو.

**جویا** / cûyā /: *صفت.* پرسا؛ پرسێن؛ جۆیا ‹جویای حال شدم: پرسای حاڵی ئێوە بووم›.

**جویان** / cûyān /: *صفت. [ادبی]* پرسان؛ جوویان؛ خەریکی پرس و جۆ بوون ‹باز چون گمگشته‌ام جویان دوست: دیسان وەک مەجنوون پرسانی یارم›.

**جویبار** / cûybār ، ـها؛ ـان /: *اسم.* جۆبار؛ ماڵجۆ؛ شەقەجۆ؛ شەقەجۆگەلە؛ جۆگەلەی گەورە کە ئاوی لە یەکگرتنەوەی دوو یان چەند جۆگەلەوە پێک دێت.

**جویدن** / cavîdan /: *مصدر. متعدی.* // **جوید**: جاویت؛ **می‌جوی**: دەجاوی؛ **بجو**: بجاوە // ۱. جاوین؛ جایین؛ جوون؛ جووین؛ جویتن؛ جوین؛ جووتن؛ نئورین؛ لووچکاندن؛ جاکاندن؛ ژاوەی؛ ژاوای؛ شتێ لە ژێر ددانادا وردکردن ‹غذا را جویدن: چێشت جاوین› ۲. کرماندن؛ کرتاندن؛ خرماندن؛ کرۆتن؛ کرۆتەی؛ کرۆژتن؛ داکرۆتن؛ ددان بەیەکدا ساوین بۆ وردکردنی شتێ ۳. *[مجازی]* جاوینەوە؛ قسە جووینەوە؛ قسە جاوین؛ قسەکردن بە شێوەیەک کە بیسەر باشی تێنەگا. هەروەها: **جویدنی**

■ صفت فاعلی: **جونده** (جاوێنەر)/ صفت مفعولی: **جویده** (جاویاگ)/ مصدر منفی: **نجویدن** (نەجاوین)

**جویده** / cavîde /: *صفت. [مجازی]* ناتەواو؛ ناتواو؛ کەل‌کراو؛ لاکەل؛ لاگەز؛ کرچوکاڵ.

▣ **جویده/ جویده ـــ جویده حرف زدن**: *[کنایی]* ئارد لە دەمدا بوون؛ برکە ـــ برکە

قسەکردن؛ پرتەپرت‌کردن.

**جوین** / covîn/: *صفت.* جۆیین؛ جەوین؛ یەوین؛ یەوینە؛ درووسکراو لە جۆ ‹نان جوین: نانی جۆیین›.

**ـجویی** / cûyî/: *پیوازه.* ـ جۆیی؛ ـ خوازی ‹دانشجویی: زانست‌خوازی›: **جوئی**

**جهات** / cahāt/: [عربی] جمعِ ☜ **جَهَت**

**جهاد** / cahād ، ـها/: [عربی]/*اسم.* پەیکار: ١. شەڕ؛ جەنگ؛ سواژ ٢. *[اسلام]* خەبات؛ جەنگ لە ڕای خودا.

**جهادگر** / cahādgar ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* خەباتکار؛ خەبات‌گێڕ؛ شۆڕشگێڕ؛ پەیکارڤان.

**جهاز** / cahāz ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ١. دەزگا؛ کۆندام؛ کەرەسە؛ کەرەستە ٢. *[گفتاری]* باوانی؛ ڕەهال؛ ڕەهەل؛ پێتک؛ پێتەک؛ جیازی بووک ٣. *[قدیمی]* کەشتی؛ پاپۆڕ؛ واپۆڕ؛ گەمیە ٤. سازوبەرگ.

◘ **جهاز هاضمه:** کۆ ئەندامی هەرس؛ دەزگای گەوارشت.

**جهال** / cohhāl/: [عربی] جمعِ ☜ **جاهل**[٢]

**جهالت** / cahālat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* گەوجی؛ نەزانی؛ نەفامی ‹جهالت بود، آن کار را قبول نکرد: گەوجی بوو، ئەو کارەی قەبووڵ نەکرد›.

**جهان** / cahān/: *اسم.* دنیا: ١. جەهان؛ جیهان؛ عالەم؛ دنێ؛ گۆی زەوین و ئەوەی کە تێیدایە ‹مردم جهان: خەڵکی دنیا› ٢. جیهان؛ ئەو بەشە لە زەوی کە لە چاو بەشەکانی‌تر تایبەتیێکی جیاوازی هەیە ‹جهان سوم: دنیای سێهەم› ٣. *ـها/* بەردەست؛ قەڵەمڕەو ‹جهان حیوانات: دنیای گیانەوەران› ٤. *ـها/* ئەوی کە لە ئاسماندا هەبێ و دەستی ئێمەی پێ‌نەگا ‹جهان دوردست: دنیای دوورەدەست› ٥. جەهان؛ جیهان؛ بەشێک یان بەرەیەک لە دانیشتوانی زەوی کە لە کات یان شوێنێکی دیاریکراودا دەژین ‹جهان باستان؛ جهان غرب: دنیای کەڤنارا؛ دنیای ڕۆژاوا› ٦. جیهان؛ هەند یان مەودای یەکجار زۆر و زەوەند ‹یک جهان کار: دنیایەک کار›.

◘ **جهان آزاد:** جەهان/ دنیای ئازاد؛ ناوێ کە ولاتانی پێشکەوتوو لە خۆیانیان ناوە.

**جهان دیگر:** *[مجازی]* ئەو دنیا؛ جێ مرۆڤ (یان ڕۆحی) دوای مردن.

**جهان سوم:** جەهان/ دنیای سێهەم؛ ناوێکی هەمووانی بۆ ولاتانی دواکەوتوو.

**جهان‌آرا** / cahānārā ، ـیان/: *صفت. [ادبی]* ڕازێنەری جیهان؛ دنیاڕازێن؛ جەهان‌نەژر.

**جهان‌آفرین** / cahānāfarîn, cahān'āfarîn/: *اسم.* خودا؛ بەدیهێنەری دنیا؛ خولقێنەری جیهان؛ کەسێ کە کەس شەریکی نیە.

**جهان‌بین** / cahānbîn/: *صفت.* چاوباز؛ توانا لە تێگەیشتن لە دۆخی جیهان.

**جهان‌بینی** / cahānbînî ، ـها/: *اسم.* ١. ڕوانگە؛ دیمانەی گشتی لە بۆچوونی گشتی و یەکپارچە لەمەڕ دیاردەگەل و ڕووداوەکانی جیهانەوە ‹او جهان‌بینی مشخصی ندارد: ئەو ڕوانگەیەکی دیاریکراوی نیە› ٢. تێڕوانین؛ بڕوا و بۆچوونی ڕێبازێکی دینی یان فەلسەفی یان ڕامیاری سەبارەت بە جیهان و هەرچی تێدایە ‹جهان‌بینی توحیدی: تێڕوانینی تاکەپەرستی›.

**جهان‌پناه** / cahānpanāh/: *صفت. [نامتداول]* پاڵپشتی جەهان؛ پشتیوانی جیهان ‹شاه جهان‌پناه: پادشای پاڵپشتی جەهان›.

**جهان‌پهلوان** / cahānpahlavān/: *صفت.* پاڵەوانی جیهانی؛ پاڵەوانی هەموو جیهان.

**جهانتاب** / cahāntāb/: *صفت. [ادبی]* جیهان‌گەشێن؛ جیهان‌ڕەوشێن؛ ڕۆشن‌کەرەوەی دنیا؛ بە تروسکانەوە لە جیهاندا و هۆی ڕووناکی دنیا.

**جهانخوار** / cahānxār ، ـها؛ ـان/: *صفت. [مجازی]* دنیاخۆر؛ بە واز و کردوکۆش بۆ گرتنی

سـەرچاوکە ئابووریـەکانی جیهـان ‹امپریـالیزم جهانخوار: ئەمپریالیزمی دنیاخۆر›.

**جهاندن** / cahāndan/: *مصدر. متعدی. //* **جهاندی:** هەڵتبەزاند؛ **مـی جهـانی:** هەڵـدەبەزێنی؛ **بجهـان:** هەڵــبەزێنە// هەڵــبەزاندن: ۱. دەرپەڕانــدن؛ هەڵبەزاندنەوە؛ پەڕچاندن؛ بەلقانـدن؛ پڕتافتـەی ۲. باز پێدان؛ پەڕاندن * **جهانیدن**

■ صـفت فـاعلی: **جهاننـده** (هەڵـبەزێنەر)/ صـفت مفعـولی: **جهانـده** (هەڵـبەزێنراو)/ مـصدر منفـی: **نجهاندن** (هەڵنەبەزاندن)

**جهاندیده** / cahāndîde ، ـها؛ ـگان/: *صفت. [ادبی]* بەئەزموون؛ دنیادیدە؛ دنیادیتوو؛ دنیاگەڕیدە؛ بـە ئاگاداری لە کاری جیهان، بە بۆنـەی تێپـەڕینی تەمەن و تاڵ و سوێر چێشتنی زۆرەوە.

**جهانـشمول** / cahānšomûl/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت.* جــەهانپۆش؛ دنیــا داگــر؛ دەبــەرگری سەرانسەری جیهـان ‹قـانون جهانـشمول: قـانوونی جەهانپۆش›.

**جهان‌شناسی** / cahānšenāsî/ ☜ **کیهان‌شناسی**

**جهانگرد** / cahāngard ، ـها؛ ـان/: *اسم.* گەشـتیار؛ دنیاگــەڕ؛ جیهانگــەڕ؛ دنیــاگێڵ؛ ســەیرانکار؛ شــارانگەڕ؛ شارانگەشــت؛ گەڕیــدەی وڵاتــانی جۆراوجۆر.

**جهـانگردی** / cahāngardî/: *اسـم.* گەشـتیاری؛ دنیاگەڕی؛ سەیرانکاری؛ شارانگەڕی؛ گەڕیدەیی: ۱. سەفەر بۆ شاران و وڵاتانی جیهان بۆ تەمەشا و ناسین و فێربوون ۲. دامەزراوەیەک بۆ دابـین کــــردن و بـــــەڕێوەبردنی پێداویـــــستی و بەرهەڤیەکانی گەشتیاران * **گردشگری**

**جهانگشا** / cahāngošā ، ـها؛ ـیان/: *صفت.* دنیـاگر؛ جەهان‌گر؛ جیهان‌داگیرکـەر؛ بـە تایبەتمەنـدی یان توانای داگیرکردنی جیهانەوە ‹تیمور جهانگشا: تەیمووری جیهان‌گر›.

**جهانگشایی** / cahāngošāyî ، ـها/: *اسم.* دنیـاگری؛ جیهان‌گری؛ کارەڕەهاتی داگیرکـردنی وڵاتـانی دنیا.

**جهانگیر** / cahāngîr/: *صفت.* دنیاگر؛ جەهان گـر؛ دنیا داگر: ۱. بە برەو و بەربڵاوی لە سەرانسەری جیهانـــدا ‹جنـگ جهـانگیر: شـەڕی جیهـانگر› ۲. جیهان‌داگیرکەر * **عالمگیر**

**جهان‌مطاع** / cahānmotā'/: [فارسی/ عربی] *صفت.* تایبەتمەنــدی کەســێ کــە تــەواوی دنیــا گوێ‌ڕایەڵیەتی.

**جهان‌نما** / cahān.nemā/: *صفت.* جیهـان‌نـوێن؛ دنیانوێن؛ نیـشاندەری هـەموو جیهـان ‹نقشەی جهان‌نما: نەخشەی جیهان‌نوێن›.

**جهان‌وطنی** / cahānvatanî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* جیهان‌نیـشتمانی؛ جیهـان‌زێـدی؛ ڕوانگەیـەکی فەلسەفی و سیاسی کە جیایی سنووران، وڵاتان، داب و نەریتی فەرهـەنگی و هـەروەها هەسـتی نیشتمان پەروەری بـە نـاڕەوا دەزانـێ و بـانگی تاکانەیی مرۆڤ دەدا. هەروەها: **جهان‌وطن**

**جهـانی** / cahānî/: *صـفت.* جیهــانی؛ دنیـایی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە جیهان ‹رویداد جهـانی: ڕووداوی جیهانی› ۲. پێوەندیـدار یـان سـەر بـە نەتـــەوەکان، دەوڵـــەتان یـــان وڵاتـــانی جیهان ‹کنفرانس جهانی:کۆبوونەوەی جیهانی›.

**جهانیان** / cahāniyān/: *اسم.* جیهانیـان؛ هـەموو خەڵکی دنیا.

**جهانیدن** / cahānîdan/ ☜ **جهاندن**

**جهـت** / cahat ، ـها؛ جهات/: [عربـی] *اسم.* ۱. لا؛ تەنشت؛ بەر؛ سۆ؛ بەرەوگە ‹شش جهت: شەش لا› ۲. هۆ؛ سۆ؛ سۆنگە؛ بۆنە ‹به چه جهت این حـرف را می‌زنی؟: بە چ هۆیەک ئەم قسە دەکەی؟›.

▣ **از هر جهت:** لە هەر لاوە؛ لە هـەر لایەکـەوە؛ لە هەموو بارێکەوە.

**به جهت:** ۱. بە بۆنەی؛ بە هۆی؛ بە خـاتر؛ لـە بەر؛ وەروو ‹به جهت سهل‌انگاری جریمـه شد: بـە بۆنەی کەمتەرخەمیەوە سزیا درا› ۲. ☜ **جهتِ**

**به هر جهت:** هەر چۆنێک بـێ؛ هـەر چۆنێکـە؛

هـەر جۆرێـک بێـت ‹بـە هـر جهـت، مـن دیگـر نمی‌توانم همکاری کـنم: هەر چۆنێک بێ، من چیتر ناتوانم هاوکاری بکەم›.

◘ **جهت دادن:** خستنه لا؛ خستنه سـەر هـێڵ؛ بەرەو ئامانجی پێویست هاندان.

**جهت** / cahate/: [از عربی] حرف. بـۆ؛ بـە بۆنـەی؛ پەی؛ ئەڕای؛ ڕای ‹جهت خرید خانه پول لازم داشتم: بۆ سەندنی خانوو پارەم پێویست بوو›.

**جهتگیری** / cahatgîrî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ڕووتێکـەری: ۱. کـار و ڕەوتی گـرتن بـەرەو شوێنێکی دیاریکراو ۲. هەڵوێستگری.

**جهت‌نما** / cahatnemā ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ڕوونمـا؛ لانـوێن؛ لانمـا؛ ئـەوەی لا یـان ڕووی شتێک نیشان دەدا.

**جهت‌یابی** / cahatyābî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. لادۆزی؛ لایـەن‌دۆزی؛ کـار یـان ڕەوتی دیـاری کردنی بەرەوگەی ویستراو؛ نیـشاندانی بـاکوور، باشـوور ... ‹جهـت‌یـابی در جنگـل دشـوار اسـت: شوێن‌دۆزی لە لێرەواردا حەستەمە›.

**جهـد** / cahd ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. کۆشـش؛ کۆششت؛ پـەل‌وپـۆ؛ خـەبات؛ کـار؛ کردوکـۆش؛ تەپـشت؛ جـەرد؛ کـار یـان ڕەوتی تێکۆشـین؛ دڵدانه سەر و گوێ پێدان.

◘ **جهد بلیغ** ☜ سعی بلیغ، **سعی**

◘ **جهـد کـردن:** خـەبات‌کـردن؛ خـەبتین؛ تێکۆشـان؛ پـەل‌وپـۆکردن؛ تەپـشت‌کـردن؛ کۆششت کردن.

**جهر** / cahr/: [عربی]/اسم. ڕک؛ ورک؛ پێ‌داگری و سوور بوون لە سەر قـسەی خـۆ و وەرنـەگرتنی قسەی ڕاستی کەسانی‌تر. هەروەها: **جهر کردن**

**جهـش** / caheš ، ـهـا/:/اسـم. هەڵـبەز: ۱. دەرپەڕینی بـە تـەوژم؛ جووڵـەی لەپـڕ و بـە تەوژم بەرەو بان ‹جهش آب از فواره: هەڵبەزینی ئاو لە فوارەوە› ۲. قەفاز؛ وزاق؛ بازباز؛ لۆتـک؛ کـاری پەڕین؛ بازدان؛ خۆهەڵدان؛ پـڕەی؛ قـەگەمزین؛ بازدان بە سەر شتێکدا ‹جهش از دیوار: هەڵبەز بـە سەر دیواردا› ۳. *[زیست‌شناسی]* مووتاسـیۆن؛ بـاز؛ گۆڕانی کوت‌وپڕی لـە تایبەتیـەکانی پێکهاتـەی ژینەوەرێکـدا، کـە دەبێتـە هـۆی پەیـدا بـوونی گۆنەیەکی تازە.

**جهل** / cahl/: [عربی]/اسم. ۱. نـەزانی ‹علـم نـور است و جهل تـاریکی: زانـست وەکـوو ڕۆژە و نـەزانی شەوە› ۲. *[گفتاری]* ڕک؛ ورک؛ پێ‌داگری لە سەر ناڕەوا.

◘ **جهل مرکب:** تـەواو نـەزانی و بـێ‌خەبـەری؛ دۆخی کەسێ که نەزانه و خۆی نازانێ.

**جهنـده** / cahande ، ـگـان/: صفت. بەهەڵـبەز؛ پەڕشـتی؛ خـاوەنی تایبەتمەنـدی هەڵـبەزین ‹موش جهنده: مشکی بەهەڵبەز›.

**جهـنم** / cahannam/: [معـرب از عبـری]/اسـم. جەهەننەم؛ جەهەنم؛ جەهەندەم؛ جەحەنـدەم؛ جـەحانم: ۱. دۆزەخ؛ دۆژەهـ ؛ دۆژە؛ دۆزەق؛ توون؛ هاتوون؛ شوێنـی گوناباران لە دنیـای دوای مەرگدا ‹جایش وسط جهنم است: جێگای ناوەڕاستی دۆزەخە› ۲. *[مجازی]* جێگای زۆر گەرم و ناخۆش ‹تابستانها جهنم می‌شود: هاوینان دەبێته جەهەندەم› ۳. *[گفتـاری]* بـە تـوون؛ بـە دەرەک ‹جهـنم کـه نمی‌آیی: به توون که نایی›.

◘ **به جهنم:** به توون؛ بـە جـەحانم؛ بـە دەرەک؛ وشەی نیشانەی بێزاری ‹به جهنم که نمـی‌آیـی: نایی به توون›.

**جهنم دره** / cahannamdarre/: [معـرب/ فارسـی] اسم. *[تعریض]* کەلاوە؛ کەلاوەکۆن؛ کاولەو بـووگ؛ شوێنی زۆر ناخۆش و نالەبار و بەئازار.

**جهنمی** / cahannamî/: [معرب] صفت. دۆزەخی؛ دۆژەهی: ۱. بێ‌ئاکار؛ خراوکار و لایەق به دۆزەخ ‹می‌دانم ایـن مـرد جهنمـی اسـت: دەزانم ئـەم پیـاوە دۆزەخیـە› ۲. زۆر نـاخۆش؛ زۆر خـراپ وەکـوو جەهەندەم ‹شهر جهنمی: شاری دۆزەخی›.

**جهود** / cuhûd, cohûd ، ـها؛ ـان/: [آرامـی]/اسم.

جووله‌کە؛ جوو؛ جووهی؛ مووسایی.

**جهیدن** / cahîdan/: *مصدر. لازم.* // **جهیدی:** هەڵبەزیت؛ **می‌جهی:** هەڵدەبەزی؛ **بجه:** هەڵبەزە// هەڵبەزین؛ هەڵوەزین؛ خۆ هەڵدان؛ باز بردن؛ وزاق بەستن؛ ڤەگەمزین؛ هلقەواستن؛ بەهین؛ چرین؛ لۆدکین؛ لۆقژین؛ لە ناکاو بۆ سەرەوە بزوان یا جێ گۆڕین ‹از جا جهیدن: لە جێوە هەڵبەزین›.

■ صفت فاعلی: **جهنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **جهیده** (هەڵبەزیو)/ مصدر منفی: **نجهیدن** (هەڵنەبەزین)

**جهیز** / cahîz/: [از عربی] ☜ **جهیزیّه**

**جهیزیـه** / cahîzîyye/: [از عربی]/*اسم.* باوانی؛ پێتەک؛ پێتک؛ ڕەسەت؛ ڕیسە؛ ڕەهەل؛ ڕەهاڵ؛ جیازی؛ جیاز؛ وەردەک؛ ناوتێلانە؛ شەکێرت؛ کەلوپەل و شتومەکێ کە لەگەڵ بووکدا بۆ ماڵەزاوای دەنێرن: **جهیز**

**جیب** / ceyb ، ـها؛ جیوب *[نامتداول]*/: [عربی]/*اسم.* *[ادبی]* پستۆک؛ پستۆ؛ پێسیر؛ بەرۆک؛ بەرۆکە؛ یەخە؛ یاخە؛ ئێخە؛ یەخێ؛ ملیوان ‹جیب پیراهن: یەخەی کراس›.

**جیب** / cîb ، ـها/: [عربی]/*اسم.* گیرفان؛ گیفان؛ کێمانی؛ کورک؛ بەری؛ جیڤ: ۱. کیسەیەکی چکۆلە کە بە سەر ئاسەڕەوە دەدووروێ و لە سەر و لە لاوە دەکرێ، شتی تێ بنرێ ‹جیب شلوار: گیرفانی پانتۆڵ› ۲. قەڵشتی وەک گیرفان لە کیف، چەمەدان یان شتانی‌تردا ۳. *[کنایی]* جێی پارە ‹با جیب خالی رفته بازار: بە گیرفانی خاڵیەوە چۆتە بازار›.

◙ **جیب خالی:** *[کنایی]* گیرفان خاڵی؛ بێ‌پوول.

**جیب خالی پز عالی:** *[کنایی]* بێ‌پارە و تەڕپۆش؛ فەقیانە چەرمگ، سەڵتە با بردوو؛ نانی جۆ و تری سۆڵ.

▣ **جیب دوختن برای چیزی:** *[کنایی]* کیسە دووراندن بۆ شتێ؛ هیوای بە دەست هێنانی ئەو شتە هەبوون (زیاتر بە ناڕەوا) ‹اکبر برای پولهای پدرزنش جیب دوخته بود: ئەکبەر بۆ پارەکانی خەزوورەی کیسەی دووریبوو›: **کیسه دوختن برای چیزی**

**جیب کسی را بید خوردن** ☜ **جیب کسی را کارتنک/ تارعنکبوت بستن**

**جیب کسی را خالی کردن:** گیرفان کەسێ داتەکاندن؛ کەسێک ڕووت‌کردنەوە.

**جیب کسی را زدن:** گیرفان کەسێ بڕین؛ دزینی شت لە گیرفانی کەسێک.

**جیب کسی سوراخ بودن:** *[کنایی]* هەڵەخەرج بوون؛ دەس با بوون؛ بلەخەرج بوون.

**جیب کسی را کارتنک/ تار عنکبوت بستن:** *[کنایی]* سپێ لە گیرفان کەسێکدا هەڵتیقان‌کردن؛ سپێ لە گیرفان کەسێکا سەوزەڵەخان خوێندن؛ ڕشکی نەبیەی؛ زۆر دەستەنگ و بێ‌پووڵ بوون: **جیب کسی را بید خوردن**

**جیب(آنان) یکی بودن:** *[کنایی]* ماڵ لە یەک بوون؛ نان لە هەوانەیەکدا بوون؛ لە ماڵی خۆ یەکتری بە هاوبەش زانین.

**از این جیب به آن جیب ریختن:** *[کنایی]* دنیا لە کۆڵ نان؛ گوریسی زۆر بە دنیاوە هەڵگرتن؛ دنیا بە تەنگاوتیلکەوە هەڵگرتن؛ خستنە سەر یەک؛ تەپەڵ‌کردن؛ لەم لا و لەو لا تێخستن؛ پارە کۆکردنەوە و خستنە سەر یەک.

**از جیب خوردن:** *[مجازی]* دەم لە کۆپانی خۆ نان؛ وەک وشتر لە باری خۆ خواردن؛ لە پاشەکەوت خواردن؛ بێ‌دەرامەت بوون: **از کیسه خوردن**

**از جیب رفتن:** لە دەس دان؛ لە کیس چوون؛ بە دەس نەهاتن؛ گیر نەهاتن: **از کیسه رفتن**

**به جیب زدن:** *[کنایی]* دزین؛ قاپاندن؛ کردنە گیرفاندا؛ ئرفانەی.

**دست به جیب بودن** ☜ **دست**

**دست به جیب نرفتن** ☜ دست کسی به/ توی

جیبش نرفتن، **دست**

**جیب‌بر** / cîb.bor ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. گیرفان‌بڕ؛ بەرک‌بڕ؛ کیسەبڕ؛ جێوبڕ؛ کەسێ کە دەست بە گیرفانی خەڵکدا دەکا و پارەیان لێ دەدزێ.

**جیب‌بری** / cîb.borî/: [عربی/ فارسی]/اسم. گیرفان‌بڕی؛ کاری دزینی پارەی ناو گیرفانی کەسان.

**جیب پالتویی** / cîbpāltoyî/: [عربی/ فرانسوی] ☜ قطع جیب پالتویی، **قطع**

**جیبرلین** / cîberlîn/: [؟] ☜ **ژیبرلین**

**جیب کن** / cîbkan ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* تەڵەکەباز؛ بە خوو یان وازی بەرتیل‌خۆری.

**جیب کنی** / cîbkanî/: [عربی/ فارسی]/اسم. تەڵەکەبازی؛ کار یان ڕەوتی تەڵەکەکردن و پارە وەرگرتن لە کەسان.

**جیبی** / cîbî/: [عربی]/اسم. *صفت.* ۱. /ـها/ باخەڵی؛ گیرفانی؛ لەباو بۆ ناو گیرفان ‹ساعت جیبی: سەعاتی باخەڵی› ۲. ☜ قطع جیبی، **قطع**

**جیپ** / cîp/: [انگلیسی]/اسم. جیپ؛ جیب؛ ناوی جۆرێ ماشینی سواری لەبار بۆ کەژ و کێو.

**جیپ‌استیشن** / cîpesteyšen ، ـها/: [انگلیسی] /اسم. جیپستەیشن؛ جۆرە جیپێک بە زۆرتر لە دوو ڕیز سەندەڵیەوە.

**جیر** / cîr/: [ترکی]/اسم. گلاسی؛ گێلاسی؛ جۆرێ چەرمی نەرم و کوڵکن.

**جیر-جیر** / cîrcîr/: *صوت.* ۱. جیرە؛ جیرە-جیرڕ؛ ئەو دەنگە باریک و ناسکەی کە لە دەرگای کۆنەوە دەردێ ۲. جریوە؛ دەنگی هەندێ لە پەلەوەران یان مێروویان (وەک بەرزەچڕ).

▣ **جیر-جیر کردن:** جیراندن؛ جیرەجیر کردن؛ دەنگی جیرەجیر خۆش‌کردن.

**جیرجیرک** / cîrcîrak ، ـها؛ ـان/:/اسم. بەرزەچڕ؛ شیرشیرە؛ زیرزیرە؛ جرجرە؛ زیرزیرەک؛ جانەوەرێکی پچووکی وەک کوللە کە جیرەجیر دەکا.

**جیرو** / cîrû/: [انگلیسی از ایتالیایی]/اسم. [بازار] واژۆ: ۱. ئیمزا ۲. مۆر بە قەباڵەوە نان؛ پشت نووسینی بەڵگە.

**جیره** / cîre ، ـها/: [از عربی]/اسم. مووچانە؛ جیرە؛ دەستنەوە؛ دەستننە؛ بەشێکی نەگۆڕ لە خواردەمەنی و کالای پێداویستی کە لە ڕۆژ، حەفتە یان مانگدا بە کەسێکی دەدەن.

▣ **جیرەی خشک:** جیرەی وشک؛ ئازۆخە؛ ئەوی هێشتا بۆ خواردن نابێ (وەک ئارد، گەنم، نیسک و نۆک و...).

**جیرەی نقدی:** مووچە؛ جیرە؛ پارەیەک کە بە جێی مووچانە دەدرێ.

**جیره‌بندی** / cîrebandî ، ـها/: [از عربی/ فارسی] /اسم. جیرەبەندی؛ کار یان ڕەوتی بەش‌کردنی خواردەمەنی یان هەر شتێکی‌تر کە کەم بێ و دەبێ دەستی پێوە بگیرێ کە بە هەمووان بگا.

**جیره‌خوار** / cîrexār ، ـها؛ ـان/: [از عربی/ فارسی] /اسم. ۱. مووچەخۆر؛ جیرەهەر؛ کەسێ کە لە کەسێ یان شوێنێ مووچە دەگرێ ۲. *[کنایی]* نۆکەر؛ بەردەست؛ گزیر.

**جیره مواجب** / cîremavāceb/: [از عربی]/اسم. *[گفتاری]* مووچە ☜ **حقوق-۲**

**جیرینگ** / cirîng/: *صوت.* زرینگە؛ زرنگە؛ جرینگە؛ دەنگی تیژ کە لە لێکەوتنی کانزا (بەتایبەت سکە)، شووشە یان چینیەوە دەردێ: **جرینگ**

**جیرینگی** / cirîngî/: *قید.* ۱. بەزرینگەوە ۲. *[مجازی]* نەخت ‹صد هزار تومان جیرینگی شمرد و گذاشت و رفت: سەد هەزار تمەنی نەخت ژمارد و دainا و لێدا ڕۆی› ✱ **جرینگی**

**جیز** / cîz/:/اسم. *[کودکانه]*/۱. ئاگر؛ ئاور؛ ئایر ۲. بقە؛ هەر شتێ کە داخە و نابێ تخوونی بکەوی ۳. *[مجازی]* چرا.

▣ **جیز کردن:** ۱. سووتاندن؛ سووزاندن دەکا.

٢. زەخمارکردن؛ زامدارکردن؛ بریندار کردن.

**جیش** / ceyš/: [عربی] *اسم. [ادبی]* سپا؛ لەشکر؛ لەشکەر.

**جیش** / cîš/: *اسم. [کودکانه]* مێز؛ میز؛ گمێز؛ گمیز.

▣ **جیش داشتن:** مێز هاتن؛ میز هاتن؛ گمیز هاتن؛ گمێز ئامەی.

**جیش کردن:** مێزکردن؛ میزکردن؛ گمیز کردن؛ گمێزکەردەی.

**جیغ** / cîq ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* زیرە؛ قیژە؛ زیقە؛ چێقە؛ قیچە؛ زریک؛ زریکە؛ زریکان؛ قیژوور؛ قیژوهۆڕ؛ واقی؛ شیق؛ هاواری تیژ و باریک (وەک هاواری منالان و ژنان).

▣ **جیغ زدن/ کشیدن:** زیقاندن؛ زریکاندن؛ قیژاندن؛ شیقین؛ چێقنەی ‹چرا جیغ می‌زنی؟ یواش حرف بزن!: بۆچی دەزیقنی؟ هێواش قسە بکە!›.

**جیغ‌جیغو** / cîqcîqû ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* ١. جیقن؛ جیقنیٚ؛ زیقن؛ قارقارۆ؛ بە دەنگێکی ناسک و تیژی ناحەزەوە ‹با آن صدای جیغ‌جیغو گوشم را برد: بەو دەنگە جیقنەوە گوێمی کەڕکرد› ٢. زیقاوڵ؛ زیقاوڵە؛ دەنگ‌دەرهاتوو؛ بە وازی قیژە و هەراکردنەوە ‹دو تا بچەی جیغ‌جیغو داشت که بیچارەمان کردند: دوو زارۆی زیقاوڵی هەبوون هەر کوشتمانیان›.

**جیغ‌وداد** / cîq-o-dād ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* قیژە و هەرا؛ هوریا؛ زیقە؛ چەقەچەق؛ زەود؛ قیژەقیژ؛ هەرا و زیقە؛ زەنا-زەنا؛ گوڕ-گوڕ؛ چویرە؛ هاوار؛ زیقە و هاوار؛ چیت؛ هەرا و مەزات؛ دەنگ و دۆڕ؛ هەرا و هوریا ‹با جیغ و داد که کار درست نمی‌شود: خۆ بە قیژەوهەرا کار پێک نایە›.

**جیغ‌وویغ** / cîq-o-vîq ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* دەنگەدەنگ؛ هەرا و هۆریا؛ قیژەقیژ؛ دەنگ و دۆڕی بەرز و یەک لە دوای یەک.

**جیفه** / cîfe/: [عربی] *اسم. [ادبی، نامتداول]* کەلاک؛ کەلاش؛ لاشەی بۆگەنیو.

▣ **جیفه‌ی دنیا:** *[کنایی]* بەرەشرە؛ ماڵی دنیا، کە بۆ ئیماندار وەک کەلاک بێ‌بایەخە.

**جیک** / cîk/: *اسم.* جیکە؛ دەنگی زۆر ناسک (وەک دەنگی چۆلەکە یان جووجەڵە).

▣ **جیک کسی درنیامدن:** *[کنایی]* متەق لێوە دەرنەهاتن؛ قڕوقپ کردن؛ قفڵ لە دەمی کەسێک دران؛ بێ‌دەنگ بوون؛ فزە نەکردن؛ فزە لێوە نەهاتن؛ هیچ نەوتن: **جیک نزدن**

**جیک نزدن** ☜ **جیک کسی درنیامدن**

**جیک‌ُوبُکشان یکی بودن:** *[کنایی]* بە کاسەیەک کردن و بە کەوچکێک خواردن؛ پێکەوە یەکجار زۆر دۆست و هەڤاڵ بوون.

**جیک‌ـجیک** / cîkcîk/: *صوت.* جووکە؛ جریوە و جووکە؛ جووکان؛ شقشق؛ جیقە؛ جیکەجیک؛ دەنگی پەلەوەرانی گچکە.

**جیم** / cîm/: *اسم.* جیم؛ نێوی عەرەبی پێنجەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

▣ **جیم شدن:** *[گفتاری]* ١. باریکەو بوون؛ خۆ دزینەوە؛ فیزمالک دانەوە؛ پێچ‌کردنەوە؛ خۆ باریک‌کردنەوە؛ باچاندن؛ کووزوو بوون ٢. خۆ شاردنەوە * **حَبّ جیم خوردن**

**جین** / cîn/: [از فرانسوی] *اسم.* ١. جین؛ یەکەیێکی بژاردنە، بەرامبەر بە شەش یان دوازدە دانە ‹یک جین مداد بده!: جینێک میداد بدە!› ٢. پارچەی بەنینی ئەستوور کە زۆرتر بۆ پانتۆڵ و کەوا بەکار دەچێ ٣. جۆرە شەرابێکە لە دانەوێڵە و سەڵوی کێوی دەگیردرێ.

**جیوب** / cuyûb ، ـها/: [عربی] *[نامتداول]* جمعِ ☜ **جیْب**

**جیوه** / cîve/: *اسم.* جیوە؛ زاوق؛ ژووڤە؛ توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٨٠ و کێشی ئەتومی ٢٠٠,٥٩، کە لە دەمای ئاساییدا تراوە و ڕەنگی لە زیو دەکا.

# چ

**چ** / č/: حرف. چ؛ نیشانەی حەوتەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**چ** / če/: اسم. ١. چێ؛ ناوی پیتی حەوتەمی ئەلفوبێ زمانی فارسی ٢. [مخفف] چ؛ چاپ (وەک: چ ۵: یانێ چاپی پێنجەم).

**چائی** / čā'î/: [چینی] ☜ **چایی**

**چائیدن** / čā'îdan/ ☜ **چاییدن**

**چابک** / čābok/: صفت. [ادبی] چالاک؛ چابک؛ چاپک؛ چابوک؛ چەلەنگ؛ تیژ؛ چوست؛ گوربز؛ تۆڵ؛ لەش‌سووک؛ هەرقە؛ هەدرە؛ بەدەو؛ ئازا؛ جەڵت؛ جەڵد؛ خۆشبەز؛ بەپێ؛ گورد؛ کرژ؛ قۆچاخ؛ بزێو؛ فرز؛ مەزبووت؛ لۆبت؛ لۆپت؛ لۆتەر؛ زرنگ؛ زرت و زیندوو؛ لەش‌سڤک؛ گورج؛ پەیت؛ بەدەست و برد (جوان چابک؛ اسب چابک: لاوی چالاک؛ ئەسپی خۆشبەز).

**چابکدست** / čābokdast، ـان/: صفت. [ادبی] تەڕدەست؛ دەس‌فرز؛ بەدەس؛ بەدەست؛ دەستهەل؛ مەزبووت؛ خاوەنی دەستی خێرا و کارامە (در گلدوزی خیلی چابکدست است: لە گولدووریدا زۆر تەڕدەستە). هەروەها: **چابکدستی**

**چابکسوار** / čāboksavār، ـان/: صفت. شۆڕەسوار؛ سوارچاک؛ سووکەڵەسوار؛ چاپک‌سوار؛ خاوەن لێهاتوویی لە ئەسپ‌سواری و لنگاردانی ئەسپدا.

**چابکی** / čābokî/: اسم. گورجی؛ چالاکی؛ چاپکی؛ کرژی؛ ئازایی؛ جلداکی؛ جەڵتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی گورج بوون (چابکی در پاسخ به سوالها باعث موفقیت او شد: گورجی لە وەڵامدانەوەی پرسیارەکان بوو بە هۆی سەرکەوتنی).

**چاپ** / čāp، ـها/: [سنسکریت] اسم. چاپ: ١. پیشە و زانینی لێگرتنەوەی پەرتووک و وێنە و ... لە هەژماری زۆردا بە ئامراز و کەرەستەی دروستکراو بۆ ئەو کارە (صنعت چاپ: پیشەی چاپ) ٢. کار و ڕەوتی لێگرتنەوەی نووسراوە یان وێنە بە پیتی چاپی یان پەڕەی هەستۆک و گواستنەوەیان بۆ سەر کاغەز، مەقەوا، پلاستیک و... بە دەزگای چاپ (چاپ کتاب؛ چاپ پارچە: چاپی کتێب؛ چاپی پارچە) ٣. کار یان ڕەوتی گواستنەوەی وێنەی فیلم بۆ سەر کاغەز بە لێدانی تیشک، بۆ دەرهێنانی وێنە (چاپ عکس: چاپی وێنە) ٤. سەرجەمی نوسخەگەلی کتێبێک لە یەکجاری چاپیدا (چاپ اول: چاپی یەکەم).

▣ **چاپ افست** ☜ **أفست**

**چاپ الوان** ☜ **چاپ رنگی**

**چاپ اول**: چاپی یەکەم؛ یەکەمجاری لە چاپدانی کتێب یان بلاڤۆکێک. هەروەها: **چاپ دوم؛ چاپ سوم** و...

**چاپ باتیک** ☜ **باتیک**

**چاپ برجسته**: چەشنێ چاپی ڕازێنەیی، کە

دەقــی چاپکراوەکــە بــە شــێوەی زۆپ و هەڵهاتوو دەردەکەوێ.

**چاپ رنگی:** چـاپی ڕەنگـی؛ چـاپی ڕەنگامـە؛ چاپ بە چەند ڕەنگ: **چاپ الوان**

**چاپ سربی** ☜ **چاپ مسطح**

**چاپ سنگی:** چاپە بەردینە؛ جۆرێـک شـێوەی کۆنی چاپی ئۆفسێت کە بـە جێگـەی زینـک (پلەیت)، لە قالبی بەردی کەڵک وەردەگیرا.

**چاپ سیلک:** چاپی سیلک؛ جۆرێـک شـێوەی چاپ لە سەر مقەوا، چەرم، کووتاڵ و...

**چاپ عکس:** چاپی وێنە؛ شێوەیەکی چـاپ لـە ڕووی فیلم (نیگاتیڤ)ەکەیەوە.

**چاپ عکسی:** چاپی وێنەیی؛ چاپی دەقێک لـە ڕووی وێنەی نوسخە سەرەکیەکەیەوە.

**چاپ کنتاکت** ☜ **کنتاکت-۴**

**چاپ مسطح:** چاپی تەخت؛ چاپی دەقێـک بـە پێی پیتی چاپی: **چاپ سربی**

⊡ **چاپ چیزی تمام شدن:** ١. چـاپی شـتێک تەواو بوون ‹چاپ کتاب تمام شده، رفته به صحافی: چاپی کتێبەکـە تـەواو بـووە، چـووە بـۆ جزوبەنـدی› ٢. چـاپی شـتێ تـەواو بـوون؛ فرۆشیان؛ بە فرۆش چوون ‹چاپ اولش در چهار ماه تمام شد و به چاپ دوم رسید: چاپی یەکەمی لـە چوار مانگدا تەواو بوو، چوو بۆ چاپی دووهەم›.

**چاپ زدن:** *[گفتاری]* چاپلێدان؛ فـشە کـردن؛ باپیڤان؛ گفە کردن؛ دۆدی ـ بۆدی‌کردن؛ درۆ هەڵبەسـتن؛ درۆ وەش‌کـەردەی؛ بـافیش و درۆکردن؛ شات و شووت‌کردن ‹یـک حرفهـایی چاپ می‌زند که تعجب مـی‌کنـی: چـاپی وا لێـدەدا سەرت سووڕ دەمێنێ›.

**چـاپ کـردن:** چـاپ‌کـردن؛ لـە چاپـدانی نووسراوە، بە ئامرازی چاپ.

**از چاپ درآمدن:** لە چاپ دەرهـاتن؛ چاپەنـە بەرئامەی؛ کاری چاپی شتێ (بە گـشتی) تەواو بوون ‹دیروز از چاپ درآمد: دوێنی لـە چـاپ هاتـە دەری›.

**به چاپ رسیدن:** چـاپ بـوون؛ لـە چـاپ دران ‹مقاله‌ای در آن روزنامه به چاپ رسیده است: وتارێک لەو ڕۆژنامەیەدا چاپ بووە›.

**زیـر چـاپ رفـتن:** چوونــە ژێــر چــاپ؛ دەسپێکردنی چاپی شتێ ‹کتاب زیر چاپ رفتـه است: کتێبەکە چۆتە ژێر چاپ›.

**چاپار** / čāpār ، ـها: [ترکی] *اسم. [قدیمی]* پـەیک؛ چەپەر؛ نامەبەر؛ تەتەر؛ پۆستەبەر؛ کەسـێک کـە نامە و پەیامی لە شارێکەوە بۆ شارێکی‌تر دەبرد.

**چاپارخانـه** / čāpārxāne ، ـ هـا/: [ترکـی/ فارسـی] *اسـم. [قـدیمی]* ١. پەیکخانــە؛ حەســانگەی نامەبەران؛ شوێنێ دەناو ڕێی شاراندا بـۆ وچـانی چاپـاران ٢. پۆسـتەخانە؛ پۆسـتخانە؛ پۆسـتە؛ شوێنی کۆکردنـەوە و نـاردن و هـەروەها بـەش کردنەوە و گەیاندنی نامە و بەستەی خەڵک لـە شاراندا.

**چاپـاری**[1] / čāpārî/: [ترکـی] *اسـم.* چەپـەری؛ نامەبەری؛ تەتەری؛ کار و پیشەی پەیک.

**چاپاری**[2]: *صفت.* نامەبەر؛ چەپـەر؛ تەتـەر ‹اسب چاپاری: ئەسپی نامەبەر›.

**چاپچی** / čāpčî ، ـها؛ ـان/: [اسنسکریت/ ترکی] *اسم.* چاپچی؛ ئەوەی لە چاپخانەدا کار دەکات: *الف)* کرێکــاری دەزگــای چــاپ *ب)* مەزرەکــەدار؛ چاپخانەدار؛ بەڕێوەبەر یان خاوەنی مەزرەکە.

**چاپخانـه** / čāpxāne ، ـهـا/: [اسـنسکریت/ فارسـی] *اسم.* چاپخانە؛ مەزرەکە؛ شوێنێ کـە کەرەسـە و ئامێری چاپی تێدایە و کتێب و پەرتووکانی پـێ چاپ دەکەن.

**چاپخانـه‌چـی** / čāpxānečî ، ـهـا/: [اسـنسکریت/ فارسـی/ ترکـی] *اسـم. [گفتـاری]* مەزرەکــەدار؛ چاپخانەدار؛ بەڕێوەبەری مەزرەکە.

**چاپخانـــــه‌دار** / čāpxānedār ، ـهــا؛ ـان/: [اسنسکریت/ فارسی] *اسم.* مەزرەکەدار؛ چاپخانەدار؛ خاوەن چاپخانە؛ خاوەن مەزرەکە.

**چاپگر** / čāpgar ، ـﻬا/: [سنسكريت/ فارسی]/اسم. چاپکەر؛ پێچاپکەر: ١. کەرەستەیەکی ئێلکترۆنیکیە بۆ چاپی خۆمەشی کامپیۆتەری ٢. دەزگای چاپی وێنە ❋ **پرینتر**

▣ **چاپگر سوزنی:** چاپکەری سوژنی؛ چەشنە چاپکەرێکە بە هۆی شوێنی سۆژن لە سەر نەواری چاپییەوە کار دەکات: **چاپگر نقطەای؛ دات‌پرینتر**

**چاپگر لیزری:** چاپکەری لەیزری؛ چەشنە چاپکەرێکە بە هۆی تیشکی لەیزرەوە کار دەکا: **چاپگر نوری؛ لیزر پرینتر**

**چاپگر نقطەای** ☜ **چاپگر سوزنی**

**چاپگر نوری** ☜ **چاپگر لیزری**

**چاپلوس** / čāplûs ، ـﻬا؛ ـان/: صفت. ماستاوکەر؛ مەرایی‌کەر؛ جامەلووس؛ جاملووس؛ زمان‌لووس؛ زوان‌لووس؛ لاعەبی؛ دەمتەڕ؛ خوڵتەکەر؛ دوەلەقی‌کەر؛ مەترەباز؛ چاپباز؛ پیازپاک‌کەر؛ خاپینۆک؛ خاڵەباز؛ دوفل؛ ملەمووس؛ چڵماس؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە ماستاوکاری ‹چند آدم چاپلوس دور او را گرفته بودند و بەـبە و چەـچە می‌گفتند: چەند کەسێکی ماستاوکەر دەوریان لێدابوو پێیاندا هەڵدەگوت›.

**چاپلوسانە**[1] / čāplûsāne/: صفت. زمان لووسانە؛ ماستاوکەرانە؛ دەمتەڕانە؛ جاملووسانە؛ خوڵتەکەرانە؛ هاوڕێ لەگەڵ خوڵتەدا ‹رفتار چاپلوسانەای داشت: ئاکارێکی زمان‌لووسانەی هەبوو›.

**چاپلوسانە**[2]: قید. خوڵتەکەرانە؛ ماستاوکەرانە؛ بە زمان‌لووسیەوە؛ بە خۆڵتەکەریەوە؛ بە ڕیاکاریەوە؛ بە شێوەی خوڵتەکەر ‹چاپلوسانە رفتار می‌کرد: خوڵتەکەرانە دەجووڵایەوە›.

**چاپلوسی** / čāplûsî ، ـﻬا/:اسم. شەلاخی؛ مەرایی؛ حولیاتی؛ ماستاوکەری؛ ڕووبینی؛ خوڵتەکەری؛ دەمتەڕی؛ جووچکەلەقێ؛ چڵماسی؛ ملەمووسی؛ خالەبازی؛ مەترەبازی؛ کار یان ڕەوتی کلکەفلێ و کلکەسووتەکردن بۆ فریوی خەڵک و بە ئامانج گەیشتن.

**چاپی** / čāpî/: [سنسکریت] صفت. چاپی: ١. پێوەندیدار بە چاپەوە ‹غلط چاپی: هەڵەی چاپی› ٢. چاپکراو ‹کتاب چاپی: کتێبی چاپی›.

**چاپیدن** / čāpîdan/: [ترکی/ فارسی] مصدر. متعدی. [گفتاری] // **چاپیدی:** تالانت‌کرد؛ **می‌چاپی:** تالان دەکەی؛ **بچاپ:** تالانکە// تالان کردن؛ چرپانن؛ چەپاوکردن؛ غارەت‌کردن؛ چرپ‌وچاپ کردن؛ بە ئاشکرا و زۆری، دزینی ماڵ و دارایی خەڵک. هەروەها: **چاپیدنی**

■ صفت فاعلی: **چاپندە** (تالانکەر)/ صفت مفعولی: **چاپیدە** (تالانکراو)/ مصدر منفی: **نچاپیدن** (تالان نەکردن)

**چاتلانقوش** / čātlānqûš ، ـﻬا/: [ترکی]/اسم. قەزوان؛ قەسخوان؛ قەزخوان؛ قەسقان؛ قەسقەوان؛ قەسقوان؛ قەزقەوان؛ قەزقان؛ قەسکان؛ قەسکوان؛ کەزوان؛ کزوان؛ کەزان؛ کەسکان؛: ١. وەن؛ وەنی؛ داری قەزوان؛ داری وەنەتەق؛ داری وەن ٢. وەنۆشک؛ وەنەتەق؛ وەنەتەقی؛ وەنی؛ میوەی داری قەزوان کە هێشوویەکی بۆنخۆشە و دەیکەنە ناو ترشی و چێشت و دۆ، هەروەها تەزبێحیشی لێ دروست دەکەن.

**چاتمە** / čātme/: [ترکی]/اسم. ١. چاتمە؛ پێک هەڵپەساردنی تفەنگان لە کاتی وچاندا ٢. کار یان ڕەوتی پاڵ دانەوەی سەری چەند شتی کەم تا کورت ڕاست (وەکوو چەک) بە یەکترەوە.

▣ **چاتمە زدن:** ١. پێک‌هەڵپەساردن؛ بە یەکەوە پاڵدانی چەن شت بە شێوەی چاتمە ٢. [مجازی] پەپکەدان؛ سەر بە یەکدا گرتن؛ کۆزگرتن؛ قۆنگەرە بەستن؛ کۆ بوونەوەی چەن کەس بە دەوری یەکتردا ٣. بوونە یەک؛ یەک‌گرتن؛ یەکتری گرتنەوە؛ یەکگرتنەوە.

**چاچول** / čāčûl/:اسم. [گفتاری] فێڵ؛ فڕوفێڵ؛ دەلەسە؛ گۆڕە؛ چاچۆڵ؛ نێرەنگ؛ گەڕ؛ گەزی؛

گزی؛ گزە؛ تەڵەکە؛ هەنگ؛ حەوقە.

**چاچول‌باز** / čâčûlbāz ، ـها؛ ـان/: *صفت.[گفتاری]* فێڵباز؛ چاچۆڵباز؛ جامباز؛ جانقولیباز؛ ساختەچی؛ گزیکار؛ تەڵەکەکار؛ هەنگباز؛ گەڕباز؛ حەوقەباز ‹از آن آدمهای چاچول‌باز است: لەو بنیادەمە فیلبازانەیە›: هەروەها: **چاچول‌بازی**

**چاخان**[1] / čāxān ، ـها/: [ترکی] *اسم.[گفتاری]* بافڕۆ؛ دەلەسە؛ قسەی هەڵبەستە؛ هووشە؛ فشە؛ چاخان؛ درۆی زل.

▣ **چاخان کردن:** هووشە/ فشە کردن؛ چاخان کردن؛ درۆ و دەلەسە کردن ‹تند و تند داشت چاخان می‌کرد: لەپەستا هووشەی دەکرد›.

**چاخان**[2]: *صفت.[گفتاری]* ١. درۆزن؛ باپیڤ؛ فشەکەر؛ چاپباز؛ هووشەباز؛ خۆهەڵکێش؛ شاتوشووتکەر ‹آدم چاخان: مرۆی درۆزن› ٢. فشە؛ درۆ؛ ناڕاست ‹حرف چاخان: قسەی درۆ›.

**چادر** / čādor ، ـها/: [سنسکریت]/*اسم.* چادر: ١. چارشێو؛ چارشۆ؛ چارشەو؛ چارشەوە؛ چوارشەو؛ چایر؛ هیزار؛ هیراو؛ جۆرێ پۆشەنی ژنانی موسڵمان کە تەواوی لەش دادەپۆشێ ‹چادر مادرت را بیاور سرش کند: چارشێوەکەی دایکت بێنە بیداتە سەریدا› ٢. خێوەت؛ چادرە؛ چایر؛ کۆن؛ تاوڵ؛ تئووک؛ دەوار؛ هۆبە؛ هەواری؛ چاتۆڵە؛ چاکلە؛ کوین؛ گوین؛ عەسەلە؛ کەرەستەیەکی دەس‌هەڵگر و دەق‌خۆر لە پارچەی نم نەدەر، لاسیک یان پێست یان پێست کە بە گوریس و قولاب و ئەستوندکێک هەڵیدەدەن و قایمی دەکەن بۆ مانەوە یان حەسانەوە، لە کەژ یان دەشت بەکاردێ ‹کنار رودخانه چادر زدیم و شب را توی چادر ماندیم: لە پەنای چۆمەکەوە چادرمان هەڵدا و شەو لە نێو خێوەتەکە ماینەوە› ٣. سەیوان؛ سابات؛ کەرەسەیەک لە برێزێنت یان پارچەی ئەستوور بۆ بەرگری لە تیشکی هەتاو کە لە سەر دەرکی دووکانانەدا هەڵیدەواسن ٤. چادری ماشین؛ پۆشەنێک بۆ بەرگری لە تیشکی هەتاو، تۆز و خۆڵ و بەفر و باران، کە بە سەر ماشینیدا دەدەن ‹وانت چادر نداشت، همه‌ی اثاث خیس شد: وانێتەکە چادری نەبوو، هەموو شتەکان خووسان› ٥. هەر شتێکی وەکوو چادر بێ یان کارێکی ئاوەها بکا ‹چادر اکسیژن: چادری ئۆکسیژن›.

▣ **چادر اکسیژن:** چادری ئۆکسیژن؛ جۆرێک چادری پڕ لە ئوکسیژن، تایبەت بە نەخۆشانی سینک.

**چادر کمری:** *[قدیمی]* دۆلاخ؛ فۆتەی ڕەشی سەرپۆشی ژنان کە تا سەر ئەژنۆ دەهات و بە کەمەریانەوە دەبەست.

▣ **چادر را یک شاخ انداختن:** *[کنایی]* (سەبارەت بە ژنان) داوێنی لێ بەلادا کردن؛ خۆی لێ هەڵماڵین؛ بەرهەڵستی کەسێک بوون.

**چادر زدن:** چادر هەڵخستن؛ خێوەت/ چادر هەڵدان؛ چادرە هۆردەی؛ هەڵکردنی ڕەشماڵ بۆ تێدا هێورین.

**چادرچاقچوری** / čādorčāqčûrî ، ـها/: [سنسکریت/ فارسی] *صفت.* ١. چارشێودۆلاخی؛ خاوەن هەر دوو پۆشەنی چارشێو و دۆلاخ ‹تا پیش از سلطنت پهلوی زنان ایرانی چادرچاقچوری بودند: تا بەر لە پاشایەتی پەهلەوی ژنانی ئێرانی چارشێودۆلاخی بوون› ٢. *[کنایی]* شەرمکەر؛ شەرمەکەر؛ پێداگر لە سەر داپۆشاندنی سەر و رووی خۆ ‹یک خانم چادرچاقچوری بالای مجلس نشسته بود: خاتوونێکی شەرمکەر لە سەرووی کۆڕەکەوە دانیشتبوو›.

**چادردرانی** / čādordarānî/: [سنسکریت/ فارسی] *اسم.[مجازی، گفتاری]* خولک و پێداگری زۆری میواندار لە سەر ڕاگرتنی میوان (تێبینی: زۆرتر سەبارەت بە ژنان دەگوترێ).

**چادرشب** / čādoršab ، ـها/: [سنسکریت/ فارسی] *اسم.* مەوج؛ قوماشێ چوارگۆشە و گەورە کە

نوێنی تێوە دەپێچرێ.

**چادرنشین** / čādornešîn ، ـ ها؛ ـ ان/: [سنسکریت/ فارسی] *صفت.* ڕەوەن؛ ڕەوەند؛ زەوەند؛ چادرنشین؛ کۆن‌نشین؛ چاپرنشین؛ کۆچەر؛ گەرمێن و کوێستان‌کەر؛ خێڵەکی؛ چۆڵپەرست؛ چۆڵ‌نشین؛ هەواری؛ هەواریێ؛ هۆبەیی؛ هۆبەیێ؛ هۆبەنشین؛ ڕەشماڵ‌نشین؛ خاوەن ژیانی کۆچەرایەتی.

**چادرنشینی** / čādornešînî/: [سنسکریت/ فارسی] *اسم.* کۆچەرایەتی؛ چادرنشینی؛ کۆچەری: ١. کار یان ڕەوتی نیشتەجێ بوون لە خێوەتدا وەک شوێنی ژیان و حەسانەوە ٢. قۆناغێک لە ژیانی کۆمەڵایەتی کە خەڵک (بۆ دۆزینەوەی لەوەرگە یان ڕاو) گەرمێن و کوێستانیان دەکەن و لە هۆبەدا دەژین.

**چادرنماز** / čādornamāz ، ـها/: [سنسکریت/ فارسی]*/اسم.* چادری نوێژ؛ چارشێوی نوێژ؛ چارشێو نوێژ؛ پۆشەنی ژنانە کە پتر لە پارچەی گوڵگوڵی و سووکە بۆ ناو ماڵ دەبێ.

**چادری** / čādorî/: [سنسکریت] *صفت.* چارشێوی: ١. شیاو بۆ دوورینی چارشێو ‹پارچەی چادری: کوتاڵی چارشێوی› ٢./ـها/ چارشێوپۆش؛ چارشێو بە سەر ‹زن چادری: ژنی چارشێوی›.

**چادرینە** / čādorîne/: [سنسکریت/ فارسی] *اسم. [کالبدشناسی]* چارەوەز؛ بەشێک لە ناوپەنجک کە ڕێڵەخۆ و ورگ و هەموو ئەندامانی ناو زگ ڕادەگرێ.

**چار** / čār/: *اسم. [مخفف]* چوار ‹چار پا؛ چار پایە: چوار پێ؛ چوار پایە›.

**چارباغ** / čārbāq ، ـها/: *اسم.* چوارباخ؛ بلوار.

**چارت** / čārt ، ـها/: [انگلیسی از فرانسوی] *اسم.* نوانە؛ چارت؛ گەڵاڵەیەک کە پێکهاتەی دامەزراوەیەک پیشان دەدا ‹چارت سازمانی: نوانەی مەزرینگەیی›.

**چارجینگ** / čārcîng/: [؟] *اسم.* گەشانە؛ نرخی سەرجەمی خزمەتگەلی شاری، وەک ئاو، بەرق، تەلەفوون و... بە شێوەی مانگانە: **شارژ**

**چار-چار** / čārčār/: *اسم.* ١. چوار ڕۆژی ئاخری چلە گەورە و چوار ڕۆژی ئەوەڵی چلە بچووک (٧ تا ١٤ی ڕێبەندان) کە ساردترین ڕۆژگەلی زستانن ٢. *[گفتاری]* چنگەپرچێ؛ کێبەرکێ هاورێ لەگەڵ چنگ‌ئاوش بوون و تووڕەییدا.

**چارچنگولی**[1] / čārčangûlî/: *اسم. [گفتاری]* دۆخ یان چۆنیەتی پەنجە هەڵپێکان؛ شێوازی قامکەکانی دەست کاتێ کە چووبێتنە نێو یەک و جووڵەیان لێ بڕابێ.

**چارچنگولی**[2]: *قید.* چوار دەست و پێ؛ چوار پەل؛ چار لەبک؛ چوار چنگۆلە؛ بە جووت دەست و قورس و قایم ‹چهارچنگولی چسبیده بود به میلە و ول نمی‌کرد: چوار دەست و پێ لکابووە میلەکەوە و بەری نەدەدا›.

**چارچوب** / čārčûb/ ☜ **چهارچوب**

**چارغ** / čāroq/: [ترکی] ☜ **چارق**

**چارق** / čāroq ، ـها/: [ترکی]*/اسم.* شەقاڵ؛ شەکاڵ؛ شێرۆخ؛ کالک؛ کاڵک؛ کالە؛ کاڵە؛ کاڵا؛ کاڵەک؛ کازک؛ پاتاوە؛ پاپێچ؛ پێتاو؛ خاو؛ پێتاوی لە چەرم؛ جۆرێک پێڵاوی بە موو چنراوە کە ژێرەکەی بە بەنێک دەبەسرێتە لاقەوە: **چارغ**

**چارقد** / čārqad ، ـها/: [فارسی/ ترکی؟]*/اسم.* شەلکش؛ سەرپۆش؛ لەچک؛ لەچکە؛ لەچەک؛ چارقەی؛ پارچەیەکی گەورەی چوارگۆشەیە بۆ پۆشەنی سەری ژنان، کە سووچ بە سووچ دەقی دەکەن و سێ‌گۆشە بە سەریدا دەدەن و لە ژێر ملەوە دەیبەستن.

**چارک** / čārak/: *اسم.* چارەک: ١. کەرت؛ چارەگ؛ چاریگ؛ چواریەک؛ لەچوار پاژ پاژێک ٢. *[قدیمی]* یەکەی کێشانە، بەرانبەر بە ١٠ سیر (٧٥٠ گرەم).

**چارکە** / čārake ، ـها/: *اسم.* چارەک؛ نیوەی نیوە؛ پاژێک لە چوار پاژی ئاجۆرێک.

**چارمیخ** / čārmîx :/اسم. ١. [گفتاری] خاچ؛ خاچ؛ چوارمێخ؛ چوارنیخ: **چهارمیخ** ٢. ☜ **چارمیخه**

▣ **به چار میخ کشیدن**: ١. له خاچ دان؛ چوارمێخەکێشان؛ چوارنیخەکێشان ٢. [مجازی] ڕۆح دەرهێنان؛ چاو چەرمگەوکردن؛ چۆڵەپێچە دەی؛ زۆر ئازار دان.

**چارمیخه** / čārmîxe :/قید. [گفتاری] چوارمێخە؛ چوارنیخە؛ سفتوسۆڵ؛ شەتەکدراو: **چارمیخ**. هەروەها: **چارمیخه کردن**

**چاروادار** / čārvādār ، ـها؛ ـان/:/اسم. [قدیمی] ١. ئۆلاغدار؛ ولاخدار؛ مەکارەچی؛ چاروێدار؛ چارەوێدار؛ چەروەدار؛ چاروەدار؛ هەربەنە؛ خەربەندە؛ کەردار؛ قاترچی؛ خەرەکچی؛ کەسێ کە بە یەکسم بار و مسافری ڕادەگواستەوە و کرێی وەردەگرت.

**چاروادارکش** / čārvādārkoš ، ـها/: صفت. [مجازی] گەنیو؛ گەندەڵ؛ زۆر بۆگەن و پیس (بەتایبەت سەبارەت بە خواردەمەنی).

**چاروادارى**[١] / čārvādārî :/اسم. چاروێداری؛ چارواداری؛ ئولاغداری؛ ولاخداری؛ مەکارەچیەتی؛ چاروێداری؛ کاری چاروێدار ‹سالها در مسیر سقز و بوکان مشغول چارواداری بود: چەنایچەن ساڵ لە ڕێگەی سەقز و بۆکاندا خەریکی چارویداری بوو›.

**چاروادارى**[٢]: صفت. چارواداری؛ ولاخداری؛ پێوەندیدار بە چاروێداریەوە.

**چاره** / čāre ، ـها/:/اسم. چارە؛ چار: ١. بەرەج؛ هاوڵ؛ هاویل؛ گوزوور؛ ئفنای؛ دەوەرە؛ ڕێ چارە بۆ ڕزگار بوون لە ڕووداوێکی ناخۆش یان دۆخێکی نالەبار ‹آمده بود برای مشکلش چارەای پیدا کند: هاتبوو بۆ گرفتەکەی چارەیەک بدۆزێتەوە› ٢. هەتوان؛ دەرمان؛ تیمارکاری ‹چارەی دردش را من می‌دانم: چارەی دەردەکەی من دەزانم›.

▣ **چاره اندیشیدن**: چارەسەر دۆزینەوە؛ چارە دۆزینەوە؛ دەبزاندن؛ ڕێ چارە پەیداکردن.

**چاره کردن**: چارەسەرکردن؛ چارەکردن؛ لە نێو بردنی دۆخێکی ناخۆش یان کاردانەوەکانی.

**چاره‌اندیشی** / čāre'andîšî ، ـها/:/اسم. تەگبیر؛ چارەسەردۆزی؛ دەبر؛ کار یان ڕەوتی پێشبینیکردن یان دۆزینەوەی چارە؛ ڕێگە دۆزینەوە ‹باید برای مدرسەی بچەها چارەاندیشی کنیم: دەبێ بۆ قوتابخانەی منداڵەکان تەگبیر بکەین›. هەروەها: **چاره‌اندیش**

**چاره‌جو** / čārecû ، ـیان/: صفت. چارەدۆز؛ خوازیاری دۆزینەوەی ڕێ چارە.

**چاره‌جویی** / čārecûyî ، ـها/:/اسم. چارەدۆزی؛ کار یان ڕەوتی دۆزینەوەی چارە ‹برای چارەجویی در مورد مشکلات ساختمان جمع شده بودیم: بۆ چارەدوزی سەبارەت بە گیر و گرفتیماڵەکە کۆ ببووینەوە›.

**چاره‌ساز** / čāresāz ، ـها؛ ـان/: صفت. چارەساز؛ چارەسەرکەر؛ کارساز؛ بە توانایی یان ئەگەری چارەسەرکردن ‹این تلاشها چارەساز نیست، باید فکر دیگری کرد: ئەم کردوکاشانە چارەساز نین، دەبێ بیرێکیتر بکرێتەوە›.

**چاره‌سازی** / čāresāzî ، ـها/:/اسم. ١. چارەسەرکری؛ کار یان ڕەوتی چارەسەر کردن ٢. چارەسازی؛ دۆخ یان چۆنیەتی چارەساز بوون.

**چاره‌ناپذیر** / čārenāpazîr :/ صفت. بێچارەسەر؛ بێچارە؛ بە بێ چارەسەری یان ئەگەری دۆزینەوەی چارە.

**چاشت** / čāšt ، ـها/:/اسم. ١. ڕچایی؛ ناشتایی؛ تێشت؛ بەرقلیان؛ چێشا؛ خواردنی بەیانی ٢. تاشتی؛ چاشتە؛ چاشتی؛ چاشتانە؛ سەرتێشت؛ تاشت؛ قاوەتوون؛ قاوەلتوون؛ خواردنی نێوان بەیانی و نیوەڕۆ ٣. چاشت؛ چێشتە؛ چێشتەنگا؛ چاشتێنگە؛

چاشـــتینگا؛ چێـــشتەنگاو؛ کـــاتی ناوەڕاســـتی بەیانی و نیوەڕۆ.

**چاشـنی** / čāšnî ، ـهـا/:/اسم. ۱. چێژەمـەنی؛ چاشنی؛ تام؛ چێژ؛ چاشتین؛ چێژە لـە چێـشتدا ‹چاشـنی آش: چێـژەمـەنی ئـاش› ۲. چەشـنی؛ تەرەقە ‹چاشنی گلوله: چاشنی گولله› ۳. [مجازی] تام؛ چێژە ‹چاشنی کلام: تامی قسە›.

▣ **چاشنی کلام:** تام/ چێژە/ چاشنی قسە؛ ئەوی بۆ ڕازاندنەوەی وتە ئێژنی (وەک شیعر، نـەقل، مەتەڵۆک و...).

**چاغاله** / čāqāle/ ☜ **چَغاله**

**چاق** / čāq ، ـها/: [ترکی] صفت. ۱. چـاخ؛ چـاغ؛ قەڵـەو؛ قەڵـەو؛ قـەرەو؛ گۆشـتن؛ گووشـتن؛ پڕگۆشـت؛ گانوگۆشـت؛ تێـرگۆشـت؛ ئەسـتوور؛ مەس؛ پیپـڕ؛ گونـدە؛ تفقـی؛ تـۆخ؛ چـڵ‌وچـاخ؛ هل‌هرچ؛ خرچە؛ چاخ‌وچل؛ گرەڵی قەڵەو؛ بەخۆ ‹مرغ چاق: مریشکی چاخ› ۲. [گفتاری] بـەدەماخ؛ ساق؛ بەخۆوە؛ تەندروست ۳. کۆک؛ ساز؛ تـەیار؛ گیف؛ بەرهەڤ؛ ئامادەی کار ‹قلیان چاق: قلیـانی کۆک›.

▣ **چاق بودن:** ۱. چاخ/ قەڵەو بوون ۲. [گفتاری] بەخۆوە بوون؛ تەندروست بوون؛ سـاق بـوون؛ سەرحاڵ بوون. هەروەها: **چاق شدن**

**چاق کـردن:** ۱. قەڵـەوکردن؛ چـاخ‌کردنـەوە ۲. [گفتاری] کـۆک‌کـردن؛ تەندروسـت کـردن ۳. چاخ‌کردن؛ سازکردن؛ تەیارکردن؛ بەرهەڤ کردن ‹چـاق کـردن ارّە: چـاق کـردن قلیـان: سـاز کردنـی هەرە؛ چاخ‌کردنـی قلیان›.

**چاقـالو** / čāqālû ، ـهـا/: [ترکـی/ فارسـی] صفت. [گفتاری] چاخەکەلە؛ چاخ‌کەلە؛ خەپـە؛ خەپەلـە؛ خەپلە؛ گردەڵە؛ چاخەکۆڵـە؛ چاخلـە؛ گۆشـتنی گتە.

**چـاقچور** / čāqčûr ، ـهـا/:/اسم. [قـدیمی] دۆلاخ؛ جۆرێ دەرپێی دەڵپی ژنانە، کە بـە گورەویـەوە دەدوورا.

**چاق‌سلامتی** / čāqsalāmatî/: [ترکی/ عربی]/اسم. [گفتـاری] چـاک‌وچـۆنی؛ خۆشـی‌ودشـی؛ خوەشـی‌ودوشـی؛ وەشـی‌وتـشی؛ هەواڵپرسـی ‹مدتی با مهمانها چاق‌سلامتی کـردیم: دەمـێ لەگـەڵ میوانەکان چاک‌وچۆنیمان کرد›.

**چاقو** / čāqû ، ـهـا/:/اسم. ۱. چاقۆ؛ چەقۆ؛ چەقوو؛ کـارچوو؛ چـەخوو؛ قـەچۆ؛ ئامێرێکـە بـۆ بـڕین، بریتی لە لێوارەیەکی تیژی کـانزایی و دەسـکێ کە بـە سـەریدا دەشـکێتەوە ۲. کـارد؛ کـاردی؛ کێرد؛ کێرگ؛ چێر.

▣ **چـاقو دسـته کـردن:** [مجـازی] تەقـەی ددان هاتن؛ لە سەر چـۆک لـەرزین؛ قرچـەو ددانـا ئامەی؛ لە بەر سەرماوە هەڵلەرزان ‹تـا صبح از سرما چاقو دسته کردیم: تا بەیانی لە سەرما تەقـەی ددانمان هات›.

**چاقو زدن:** چـەقۆ دان/ لێـدان؛ کەسـێک بـە چەقۆ بریندارکردن ‹دیروز یـک نفـر را چـاقو زده بودند: دوێنێ چەقویان دابوو لە کەسێک›.

**چاقو کشیدن:** چەقۆکێشان؛ نەماینـە کـاردی؛ چەقۆ (بـۆ هەڕەشـە یـان لێـدانی کەسـێک) بـە دەستەوەگـرتن و هەڕەشـە پێکـردنی ‹بـرای بـرادرزنش چـاقو کـشید: چـەقوی کێـشا بـۆ ژنبراکەی›.

**چاقوی بی‌دسته ساختن:** [کنایی] سـەری بـێ دەلاک تاشین؛ کاری بـێ سـەروبەرە کـردن؛ کـاری ناتـەواو و بـێبایـەخ کـردن؛ کـار بـە نیمەچـڵی بـەجێ‌هێـشتن ‹او از ایـن چاقوهـای بی‌دسته زیاد می‌سازد: ئـەو بـەم شـێوە سـەری بـێ دەلاک زۆر دەتاشی›.

**چـــاقوتیزکن** / čāqûtîzkon ، ـهــا/:/اسـم. چەقۆتیژکەر؛ کاردتیژکەر: ۱. کەرەسـەیەک بـۆ تیژکردنی دەمەچـەقۆ و دوێـرد ۲. کەسـێ کـە کاری تیژکردنی پێبـڕی وەک کـارد و چـەقۆ و دوێردە.

**چاق‌وچله** / čāq-o-čelle ، ـهـا/: [ترکـی/ فارسـی]

صفت. [گفتاری] قەڵەو و بەخۆ؛ گۆشتن؛ چاخەکەلە؛ قەڵەو؛ پتەوی تێرگۆشت ‹دو تا مرغ چاق‌وچله جلو در دانه می‌چیدند: دوو مریشکی گۆشتن لە بەر دەرکەکە چینەیان دەکرد›.

**چاقوکش** / čāqûkeš ، ـها؛ ـان/: اسم. چەقۆکێش؛ شەڵلاتی: ١. کەسێ کە بە چەقۆ لە خەڵکی هەڕەشە دەکا یان لێیان دەدا ٢. کەسێ کە خەرجی خۆی لە ڕێگەی لێدان و هەڕەشە بە چەقۆوە دابین دەکا. هەروەها: **چاقوکشی**

**چاقی** / čāqî/: [ترکی] اسم. قەڵەوی؛ تێرگۆشتی؛ پیپڕی؛ چاخەسێوەری؛ قەروی؛ گۆشتنی؛ چاخی ‹آدم بە این چاقی ندیدەام: مرۆڤی بەم قەڵەویەم نەدیوە›.

**چاک** / čāk ، ـها/: اسم. چاک؛ چاکە؛ شاقڵ؛ شاقەل؛ قڵش؛ قڵیش؛ قەڵیش؛ قەڵەش؛ قەڵەشت؛ شەقار؛ تیتک؛ تیک؛ تلیش قەڵیشی ورد و بچووک لە سەر شتێک ‹چاک پیراهن؛ چاک دهان: چاکی کراس؛ شەقاری دەم›.

▣ **چاک خوردن**: تلیشان؛ تلیشیان؛ هەڵتلیشان؛ شاقەل تێهاتن؛ تلیش بردن؛ هۆرتلیشیەی ‹پیراهنش از چند جا چاک خورده بود: کراسەکەی لە چەند لاوە تلیشابوو›.

**چاک دادن**: شەقاردان؛ شاقەڵ دان؛ چاک لێدان؛ قڵیش لێدان ‹گلویش را از چند جا چاک دادند و لوله گذاشتند: گەروویان لە چەند جێوە شەقار دا و لوولەیان تێخست›.

**چاک دهن باز شدن**: [مجازی] دەم لێ بەر بوون؛ دەم دان ‹نگذار چاک دهنش باز بشود: کارێ مەکە دەمی لیت بەر بێ›. هەروەها: **چاک دهن را باز کردن**

**به چاک زدن**: [گفتاری] وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچوون؛ تێتەقاندن؛ هەڵهاتن؛ خۆ دەرکردن؛ ڕاکردن؛ بەرشیەی ‹تا پاسبانها آمدند، زد به چاک: تا پاسەوانەکان هاتن، وەک بەرزەکی بانان بۆی دەرچوو›.

**چاک‌ـ‌چاک** / čākčāk/: صفت. شەقار ـ شەقار؛ فەتار ـ فەتار؛ پارە ـ پارە؛ قەڵیش ـ قەڵیش؛ ترەک ـ ترەک؛ شڕ و دڕ؛ بە قەڵشتی زۆرەوە ‹زمین از بی‌آبی چاک‌ـ‌چاک شده بود: زەویەکە لەبەر بێئاوی شەقار ـ شەقار ببوو›.

**چاکر** / čāker, čākar ، ـها؛ ـان/: اسم. چۆکار: ١. خزمەتکار؛ ژێرماڵە؛ چابر ٢. [قدیمی] نۆکەر؛ خولام؛ کەمەربەست؛ هەروەنە.

**چاکری** / čākerî, čākarî/: اسم. نۆکەری؛ چۆکاری؛ خزمەتکاری؛ پیشە یان کاری خزمەتکار.

**چاکنای** / čāknāy/: اسم. [کالبدشناسی] باریکی نێوان تارە ژێدارەکان و پێکهاتەی دەور و بەری لە نێو گەروودا: **مزمار**

**چال** / čāl ، ـها/: اسم. [گفتاری] چاڵ؛ چاڵی؛ چاڵەقووتە؛ قوولگە؛ گووڵ؛ قۆرت؛ چاوانە؛ کەند؛ کەن.

▣ **چال چانه**: دۆشەویلە؛ چاڵی چەنە؛ چاڵی چناکە؛ کووری ئەرزینگ. هەروەها: **چال گونه**

▣ **چال افتادن**: قووڵ بوون؛ قووڵ کەوتن؛ قووڵ داکەفتن؛ ئەنە قووڵایی لوەی ‹چشمهایش چال افتاده بود: چاوەکانی قووڵ کەوتبوون›.

**چال کردن**:کردنە چاڵ؛ چاڵ کردن؛ نیان؛ ناشتن؛ ڤەشارین؛ سەخت کەردەی؛ ژێر خاک کردنی شتێک ‹پولها را توی باغچه چال کرد: دراوەکانی لە نێو باخچەکەدا کردە چاڵ›.

**چال کندن**: چاڵ کەندن؛ کەندکەندن؛ چاڵ هەڵکەندن؛ کەن هۆردایوە ‹پای دیوار چال کند و رویش را پوشاند: لە بنی دیوارەکەوە چاڵێکی کەند و سەرەکەی داپۆشی›.

**چالاک** / čālāk ، ـها/: صفت. [ادبی] ئازا؛ دەست هەل؛ چالاک؛ توند و تۆڵ؛ تاشک؛ گورج؛ چابک؛ فرز؛ مەزبووت؛ تیژاو؛ لەش سووک؛ چست؛ چوست؛ گورج‌وگۆڵ؛ چوختی؛ پەیت؛ زرک؛ زرک‌وزینگ؛ زرت‌وزینگ؛ کەلەش؛ چابک؛

چەلەنگ؛ زرینگ؛ بزێو؛ قەشقە؛ خێـرا لـە کـاردا ‹در کار کردن چالاک بود اما در خوردن چالاک‌تـر!: لـە کار کردندا ئازا بوو بەڵام لە خواردندا ئازاتر!›.

**چالاکی** / čālākî/:اسم. گورج‌وگۆڵـی؛ چـالاکی؛ بەدەست‌وبردی؛ چاپکی؛ خێرایی؛ فرزی؛ توندی؛ توند و تۆڵی؛ بزێوی؛ دۆخ و چۆنیـەتی چەلـەنگ بوون ‹دستهای به این چالاکی ندیده بودم: دەسـتی وا گورج‌وگۆڵم نەدیتبوو›.

**چالش** / čāleš ، ـها/: [ترکـی]/اسم. کێـشەوبەرە؛ دەمرگـە؛ ملـە؛ کردوکاشـی چـڕ و پێـداگر، بـە تایبەت بـۆ سـەلماندن یـان وەلانـانی بابـەتێک ‹انتخابـات، همـەی گروههـای سیاسـی را بـە چـالش مـی‌طلبـد: هەڵـبژاردن هـەموو کـۆڕ و کۆمەڵـە رامیاریەکان بۆ کێشەوبەرە بانگێشتن دەکا›.

**چالگاه** / čālgāh/:اسم. [زمین شناسی] بـەفرەچاڵ؛ کۆچـاڵ؛ پیرەچـاڵ؛ وەروەجالـێ؛ قوڵـگەی بەدیهاتوو لە بەفرەچاڵی کوێستان.

**چاله** / čāle ، ـها/:اسم. چـاڵ؛ کۆرتـک؛ قووڵـکە؛ قوڵـت؛ کـوزوری؛ کەنـد؛ قووڵـگەی نـەک زۆر قووڵ.

▣ **از چاله به چاه افتادن:**[کنایی] لە باران ڕاکردن و تووشـی تـەرزە هـاتن؛ چـوون بـۆ ڕیـش و سمـێڵ دانـان؛ لـە خراپـەوە تووشـی خراپتـر بوون.

**چاله‌ـچوله** / čālečûle ، ـهـا/:اسم. [گفتـاری] ۱. کەندولەنـد؛ مـەرخ؛ درتـاڵ؛ چـاڵ‌وچـووڵ؛ چاڵ‌وچۆڵ؛ چام‌ـچام؛ چـاڵ و چۆڵـێگەلی زۆر و جۆراوجۆر ‹جادەها بر اثر بمباران پر از چاله‌ـچوله بـود: ڕێگەکان بە هۆی بومبارانەوە پڕ ببوو لە کەندولەنـد› ۲.[مجازی] کەلەبەر؛ کـەلێن؛ کـون و کەلەبـەر؛ پێداویستی؛ ڕهۆڵ؛ کەم و کووڕی ‹مقـداری پـول لازم دارم تا این چاله‌ـچوله‌ها را پر کنم: هێندێک پارەم پێویستە ئەم کون و کەلەبەرانە بگرم›.

**چاله‌حوض** / čālehowz, -ho:z ، ـها/: [فارسـی/ عربـی]/اسم. [قدیمی] خەزێنەی حەمام؛ خەزێنـەی ئاوی سارد؛ ئەستێری سەرداپۆشراو لـە حەمامـە گشتیەکاندا.

**چامه** / čāme/ ☜ **چکامه**

**چانچو** / čānčû ، ـها/:اسم. ئـەو دارە لـە سـەر شانی دەنێن و بە دوو سەریەوە سەبەتە و سەتڵ و ... هەڵدەواسن.

**چانـه** / čāne ، ـهـا/:اسم. ۱. چەنـە؛ لەچەنـە؛ چەنەگـە؛ چەناگـە؛ چناکـە؛ چناگـە؛ چناوکـە؛ چناکێ؛ چەناکێ؛ چناوە؛ چنەوە؛ چن؛ ئارزینگ؛ ئارزەن؛ ئارچەن؛ ئـەرزینگ؛ ئـەرزنگ؛ هەنـەک؛ ژوون؛ زەنـج؛ زەنی؛ زیـنج؛ زنـج؛ ئاگرگوشـک؛ بەشـی خـوارینی دەموچـاو کـە بـە شـێوەی گردۆڵـکەیێک لـە بـەر هـارووی ژێرەوەیـە ۲. گونک؛ گونکێ؛ کونگی هـەویر؛ ئەوەنـدە لـە هەویر کە بۆ نانێک جیا دەکرێتەوە.

▣ **چانـه انـداختن:**[تعـریض] لار بوونـەوە؛ پـا داکێشان؛ قاچ جـووت‌کـردن؛ دەم لێـکنـان؛ دەمەکوتێ بـوون؛ مـردن ‹دیـشب پـدرش چانـە انداخت: دوێشەو باوکی لاربووەوە›.

**چانـــه زدن:**[مجـــازی] ۱. چەقـــەکردن؛ چەقەچـەق‌کـردن؛ بـۆ ڕازی و دڵـنیا کـردنی کەسێ لە سەر قبووڵ‌کردنی کارێک زۆر قسە و باس‌کردن ‹سر قیمت کلی با فروشنده چانە زدم، ولی یک شاهی هم تخفیف نداد: لـە سـەر نرخەکـە زۆرێک لەگەڵ فرۆشیارەکە چەقـەم‌کـرد، بـەڵام شایێکیشی لێ نەشکاند› ۲. چەنـەدان؛ چناکـە دان؛ چەنە لێدان؛ چەناکە دەی؛ وڕاجی‌کردن؛ زۆربێژی‌کردن؛ چەنەبێژی‌کردن؛ شات‌وشووت کـردن؛ دەم‌درێـژی‌کـردن؛ دەم لێـدان؛ دەم هەڵەیی‌کردن؛ زۆر و بێ‌بایەخ گوتن.

**چانەی کسی گرم شدن:**[مجـازی] دەم گـرتن؛ دەم پرژان؛ گەرم داهاتن؛ چناکە شـل بـوون؛ درێژە دان بە قسە ‹چانەمان گرم شد و یک وقت دیدیم ساعت ۱۲ شد: دەممان گرت و لامان‌کردەوە سەعات ببووە ۱۲›.

**چانه گرفتن:** گونک‌گرتن؛ گونکی هەویر گرتن بۆ نان یا شیرینی.

**چاودار** / čāvdār ، ـها/:اسم. چەوان: ١. چاودار؛ چاویار؛ چێودان؛ چەودەر؛ چەودار؛ چەودەن؛ جۆ فەرەنگی؛ گیایەک لە ڕەگەزی گەنم کە گـەڵای پـانی هەیـە و سـەلکەکەی بـەلادا دەکـەوێ و دانەکانیشی دەخورێ ٢. دەنکە؛ چۆدان؛ دانـەی ئەو گیایە کە خۆراکی ئاژەڵە.

**چـاوش** / čāvoš ، ـهـا؛ ـان/: [ترکـی]/اسـم. بـەرکاروان؛ چـاوەش؛ چـووش؛ ئـەو کەسـە پێـشەنگی کـاروانی زیارەتچیانـە و بـۆ پەسـنی گۆڕی پێشەوایان و هاندانی خەڵک بـۆ زیـارەت گۆرانی دەچڕێت.

**چـاووش** / čāvûš ، ـهـا؛ ـان/: [ترکـی]/اسـم. ١. ☜ **چـاوش** ٢. [قـدیمی] جـاڕکێش و بانگـدەری پادشـایان و دەسـەلاتداران ٣. [قدیمی] کەسێ کە پێـشتر بـە دەنگـی بـەرز خەڵـکی لـە هـاتنی لەشـکر یـان پیـاوی دەسەلاتدار ئاگادار دەکرد.

**چاه** / čāh ، ـها/:اسم. بیر؛ بیرە؛ چا؛ چاڵ؛ چاڵی: ١. چە؛ قومش؛ کەنـدێکی گرۆڤـەری قـووڵ لـە زەویدا ‹چاه آب؛ چاه نفت: بیری ئاو؛ چاڵـی نـەوت›. ٢. [مجازی] گۆیخاڵ؛ قووڵکە؛ گاودی؛ قووڵی ‹راه و چاه: چاڵ و ڕێ›.

▣ **چاه آب:** چاڵاو؛ چاڵاوی؛ ویر؛ بیر؛ بیرە؛ بیراو؛ کۆچەڵـە؛ چـاڵاڤ؛ کەنـداو؛ چایـەک کـە بـۆ گەیشتن بە ئـاو هەڵـدەکەندرێت. هـەروەها: **چاه نفت**

**چاه آرتزین:** چـاڵاوێکی سروشـتی کـە (وەک فوارە) ئاوی لێ هەڵدەبەزێ: **چاه جهنده**

**چاه آسانسور:** چاڵی ئاسانبەر؛ بۆشاییەکی درێژ و تەنگ لە نێو وارخاندا، کە هۆدەی ئاسانبەر و سەنگی تەراز بوونەکـەی لەوێـدا بـان و خـوار دەکا.

**چاه پله:** بۆشایی ناو پلەی مالانی چەند نهـۆم کە پلیکانەکانی پێچ دروستکراوە.

**چاه پیشکار:** سەرکارێز؛ ژوورترین چای کارێز.

**چاه جهنده** ☜ **چاه آرتزین**

**چـاه خـشک:** چاڵـی وشـک؛ بـیری وشـک؛ چایەک کە ئاوی نەبێ.

**چاه زنخدان:** [مجـازی] کـۆرت؛ چاڵـی چەنـە؛ کۆرتا زەنی.

**چاه فاضلاب:** چای ئاوەڕۆ؛ چاڵـێ کـە بـۆ تـێ ڕژانی ئاوی پیس و زێدە، هەڵدەکەنرێت.

**چاه وِیل:** [کنایی] چاو بێبن؛ چـای بـێپـەی؛ چاڵی زۆر قووڵ ‹شکمش چاه ویل است، هر چه در آن بریزد پر نمی‌شود: سکی چای بـێبنـە، هـەرچی تێکا پڕ نابێ›.

▣ **چاه زدن:** [گفتـاری] بـیر لێـدان؛ چـا لێـدان؛ بیرکەندن ‹هر چه چاه زدند به آب نرسید: هەر چی بیریان لێدا نەگەیشتە ئاو›.

**چاه کنـدن:** بیرکەنـدن؛ چاکەنـدن؛ کەنـدنی زەوی بۆ ئاو ‹داشتند توی باغشان چـاه مـی‌کندنـد: خەریک بوون لە باخەکەیاندا بیریان دەکەند›.

**چـاهخو** / čāhxû ، ـهـا/:اسـم. قومەشـکەن؛ کەلکەلەچی؛ چاکەن؛ کەسێ کـە کـار و بـاری، پاقژکردن و دروست کردنەوەی بیر و کارێزە.

**چاهک** / čāhak ، ـها/:اسم. قووڵـکە؛ قووڵـگە؛ چاڵۆکە؛ چاڵە؛ قووڵایی دەسکرد.

**چاه‌گرفتگی** / čāhgereftegî/ ☜ **گرفتگی**[٢]

**چای** / čāy ، ـها/: [چینی]/اسم. چا؛ چای؛ چـایی؛ چایە؛ چەی؛ چـوی؛ تۆچـا: ١. ڕوەکـی چـایی؛ گیایەک لە ڕەگەزی چایی کە گەڵاکانی قـنج و پڕ و بێکولک و سەوزی تۆخە و بـۆ خواردنـەوە بەرهەمی دێنن ٢. گەڵای چایی؛ گەڵای وشـک کراوی چایی ‹یک بسته چای بخر: بەستەیەک چایی بکڕە› ٣. چای دەمکراو؛ دەمکراوی گەڵای چایی لە ئاوی کوڵهاتوودا کە بە گـەرمی دەیخۆنـەوە ‹یک استکان چای بریز!: پیاڵەیەک چایی داکە!›.

▣ **چای باروتی:** چـای بـارووتی؛ چـای کـوتراو؛

چایی زۆر نەرم؛ گەڵاچایی وشک‌کراوی باش وردکراو.

**چای پر درشت:** چای گەڵاپان؛ جۆرێک چاییە کە بە پێچەوانەی چایی باروونی گەڵاگەڵێکی پانی هەیە: **چای قلمی**

**چای تازەدم:** چایی تازەدەم؛ چاییەک تازە دەم‌کرابێ.

**چای دیشلمە:** چایی دیشلەمە؛ چاییەک کە بە قەن یان شەکر شیرین نەکرابێ: **چای قندپهلو**

**چای زرین:** چایی زەرد؛ جۆرێ چایی کە گەڵاکانی گەورە و زەرد ڕەنگە.

**چای سبز:** چایی سەوز؛ جۆرێ چایی کە دوای چنینەوەی، خێرا وشکی دەکەنەوە.

**چای سیاه:** چایی ڕەش؛ جۆرێ چایی کە گەڵاکانی شەو و ڕۆژێ بەر لە وشک کردنەوە دەیترشێنن تا ڕەش هەڵدەگەڕێ.

**چای شیرین:** چایی شیرین؛ چایێ کە بەر لە خواردنەوە، بە قەن یان شەکر شیرین کراوە.

**چای قلمی** ☜ **چای پر درشت**

**چای قندپهلو** ☜ **چای دیشلمه**

**چای کیسه‌ای:** چای کیسە؛ ئاردەچای دەنێو کیسە کراو بۆ خێرا ئامادە بوونی چایی،کە لە نێو پیاڵە یان قۆری ئاوەکوڵی دەخەن، ڕەنگ دەداتەوە: **چای لیپتُن**

**چای لیپتُن** ☜ **چای‌کیسه‌ای**

**چایخانه** / čāyxāne ، ـها/: [چینی/ فارسی]/اسم. چایخانە؛ چاخانە؛ قاوەخانە؛ شوێنی گشتی بۆ چای خواردنەوە.

**چای‌خشک‌کنی** / čāyxošk.konî/: [چینی/ فارسی]/اسم. چا وشک‌کەری: ۱. کاری وشکەوەکردنی گەڵای چایی ۲. /ـها/ شوێنی وشک کردنەوەی چایی؛ کارگای تایبەت بۆ وشک کردنەوەی چایی.

**چایخور** / čāyxor/: [چینی/ فارسی] صفت. چایخۆر؛ چاخۆر؛ بە خوو و وازی چا خواردن ‹من چایخور نیستم: من چایخۆر نیم›.

**چایخوری**[1] / čāyxorî ، ـها/: [چینی/ فارسی]/اسم. کار یان ڕەوتی چاخواردنەوە؛ چای خواردن؛ چەی واردەی.

**چایخوری**[2]: صفت. چاخۆری؛ چایخۆری؛ پێوەندیدار بە کاری چایی خواردنەوە ‹قاشق چایخوری: کەوچکی چاخوری›.

**چای‌صاف‌کن** / čāysāfkon ، ـها/: [چینی/ از عربی/ فارسی]/اسم. چاییپاڵێو؛ چاپاڵێو؛ چەی پاڵوو؛ چاییپارێز؛ چای پەرز؛ چای پارزن؛ پارزوونی چایی؛ سافیەکی گچکە بۆ پاڵاوتنی چایی و بەرگری لە چوونی تڵتە بۆ نێو پیاڵەوە.

**چایکار** / čāykār ، ـها؛ ـان/: [چینی/ فارسی]/اسم. چای‌کێڵ؛ چایکار؛ وەرزێرێ کە چایی دەچێنێ.

**چایکاری** / čāykārî/: [چینی/ فارسی]/اسم. چایکاری: ۱. /ـها/ مەزرای چا ۲. کاری وەشاندن و چاندنی چایی.

**چایمان** / čāymān ، ـها/:/اسم. [گفتاری] چایمانی؛ چیامانی، هەڵامەت؛ باپەڕ؛ واپەڕ.

⊡ **چایمان کردن:** چایمانی‌کردن؛ سەرما خواردن؛ چیامانی‌کەردەی ‹لخت نگرد! چایمان می‌کنی: ڕووت مەگەڕە! چایمانی ئەکەی›.

**چایی** / čāyî/: [چینی] اسم. [گفتاری] چایی؛ چا؛ چای؛ چایە؛ چەی: **چائی**

**چاییدن** / čāyîdan/: مصدر. لازم. [گفتاری] // **چاییدی:** ڕچایت؛ **می‌چایی:** دەڕچی؛ ــ // ڕچیان؛ ڕچان؛ چایین؛ چیەیەوەنەی؛ سەرما بوون؛ سەرما خواردن: **چائیدن**

■ صفت مفعولی: **چاییده** (ڕچاو)/ مصدر منفی: **نچاییدن** (نەڕچان)

**چپ**[1] / čap/:/اسم. چەپ: ۱. قەنبەل؛ چۆپە؛ چەپە؛ چۆپ؛ چەپەن؛ چەپیل؛ چەپال؛ چەپان؛ لای بەرانبەری ڕاست؛ ئەو لایە کە ئەگەر ڕوو لە باشوور ڕاوەستین، لە ڕۆژهەڵاتە ‹بپیچ بە چپ:

لاده بۆ چەپ› ۲. لای چەپ؛ ئەو نیوەیە لە لەش کە دڵ دەوێدایە ‹دست چپ: دەستی چەپ›
*بەرانبەر: **راست**
**چپ**[2]: *صفت.* ۱. *[مجازی]* پێچەوانە؛ چۆپەوانە ‹چپ افتادن: پێچەوانە کەوتن› ۲. شاش؛ خێل؛ خوول؛ خوێل؛ لار ‹چپ چشم: چاو خێل› ۳. چەپ؛ چۆپ؛ خاوەن جێگە لە لای چەپەوە ‹دست چپ، کوچەی دوم: دەستی چەپ، کۆلانی دووهەم› ٤. *ـها//[سیاست]* چەپ؛ چەپەوگر؛ چەپخواز؛ چەپی ‹جناح چپ: باڵی چەپ› ٥. *[مجازی]* پێچەوانە؛ چەپیوانە؛ چۆپەوانە؛ بەراوەژوو؛ هەڵەوگەڕیاگ ‹خواب زن چپ است: خەوی ژن پێچەوانەیە›.
▣ **بە چپ-چپ:** بەچەپ-چەپ؛ بەرەو چەپ؛ فەرمانی وەرگەڕان بەرەو لای چەپ.
**نظر به چپ** ☜ **نظر**
▣ **چپ افتادن:** *[مجازی]* کەوتنە قینەوە؛ نەیار بوون ‹رئیس با من چپ افتادە: ڕەییس لێم کەوتوتە قینەوە›.
**چپ-چپ نگاە کردن:** *[مجازی]* بە لاتیر/لاچاوەوە ڕوانین؛ تیر لێبردنەوە؛ لاچیر لێکردن؛ بە ڕق یان دوژمنیەوە بۆ کەس یان شتێک ڕوانین ‹داشت بە من چپ-چپ نگاە می‌کرد: خەریک بوو بە لاتیرەوە تەیروانی بۆم›.
**چپ شدن:** چپە شدن ☜ **چپە**
**چپ کردن:** چپە کردن ☜ **چپە**
**چپار** / čapār/: *صفت.* بازەڵە؛ بەڵەک؛ بازە؛ بازبازەڵە؛ خاڵماو؛ بازوو؛ بازگ؛ خاوەن پێستی خاڵ-خاڵ (ڕەشی خاڵ سپی یان بە پێچەوانەوە).
**چپ‌اندرقیچی** / čapandarqeyčî/: [فارسی/ترکی] *قید. [گفتاری]* لار و لوێر؛ لار و لەوێر؛ لار و وێر؛ لار و گێر؛ قیچەڵفاچ؛ خوار و خێچ؛ گێر و وێر ‹چرا این‌قدر چپ‌اندرقیچی دوختی؟: بۆچی ئەوندە لار و لوێر دووریوتە؟›.
**چپاندن** / čapāndan/: *مصدر متعدی.* // **چپاندی:** ئاخنیت؛ **می چپانی:** دەئاخنی؛ **بچپان:** بئاخنە// ئاخنین؛ پەستاندن؛ پەستاوتن؛ پەستن؛ ڕاپۆڕاندن؛ تێپەستاوتن؛ تێپەستان؛ تێپەستاندن؛ پەستواندن؛ تێئاخنین؛ چرپاندن؛ ئاخەنای؛ ئاخەنەی؛ تەپنەی؛ تێبرین؛ تێترنجاندن؛ تێتەپانن؛ تەپاندن؛ شتێک بە زۆر و گوشار لە بەین شتێتردا جێکردنەوە ‹خودش را چپاند توی جمعیت: خۆی ئاخنیە نێو ئاپۆڕەکەوە›:
**تپاندن؛ طپاندن**. هەروەها: **چپاندنی**
■ صفت مفعولی: **چپاندە** (ئاخنراو)/ مصدر منفی: **نچپاندن** (نەئاخنین)
**چپاول** / čapāvol، ـها/: [ترکی] *اسم.* تالان؛ بڕۆ؛ پوێر؛ پوور؛ پوویر؛ پوڕ؛ پوور؛ پەلسە؛ گلاهە؛ چەپاو؛ چەپۆ؛ چەپلاو؛ پەلیسە؛ فەرهوود؛ کەلات؛ تالان و مالان؛ تالان و تاژان؛ تالان و بڕۆ ‹بچەها ریختند توی جالیز و هندوانەها را چپاول کردند: منداڵەکان ڕژانە نێو بێستانەکەوە و شووتیەکانیان تالان کرد›.
▣ **چپاول شدن:** چەپاو بوون؛ تالان بوون؛ تالان کران.
**چپاول کردن:** چەپاوکردن؛ تالان‌کردن؛ تالان‌ومالان‌کەردەی.
**چپاولگر** / čapāvolgar، ـها؛ ـان/: [ترکی/فارسی] *اسم.* تالانکەر؛ خوداگیر؛ نەژدڤان؛ نژدە؛ **تالانچی**؛ پوورکەر؛ دەست درێژکەر بۆ مافی بێدەسەڵات.
**چپاولگری** / čapāvolgarî، ـها/: [ترکی/فارسی] *اسم.* تالانکاری؛ پوورکەری؛ نەژدڤانی؛ تالانچیگەری.
**چپ‌برتری** / čapbartarî/: *اسم.* چەپزاڵی؛ چەپچیری؛ نژدەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەهێزتر بوونی ئەندامی لای چەپی لەش. بەرانبەر: **راست‌برتری**
**چپ چشم** / čapčešm/: *صفت.* خێل؛ خوێل؛ خوول؛ خەیلە؛ چاوچەفت؛ چاوخێل؛ چاولار؛ چاوگێڕ؛ چاڤخوار.

**چپ‌چشمی** / čapčašmî/: /اسم. شاشی؛ خێلی؛ خوێلی؛ خوولی؛ چاوچەفتی؛ چاوخێلی؛ چاولاری.

**چپدست** / čapdast، ـها؛ ـان/: صفت. چەپلەر؛ چەپدەس؛ چەپێل؛ چەپێڵ؛ چۆپە؛ فێرەکار بە دەستی چەپ. بەرانبەر: **راستدست**

**چپدستی** / čapdastî/: /اسم. چەپلەری؛ چەپدەستی؛ چەپدەسی؛ چەپێلی؛ چەپی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی چەپلەر بوون ٢. هەبوونی خوو یان تایبەتمەندی کەڵک وەرگرتنی زۆرتر یان هاسانتر لە دەست (و پای) چەپ ❊ بەرانبەر: **راستدستی**

**چپر** / čapar، ـها/: [ترکی]/اسم. پەرژین؛ پەرچین؛ پەڕچین؛ چیلە؛ پەرجان؛ چەپەر؛ تانۆک؛ تان؛ تامان؛ تەیمان؛ تەیمانە؛ پەچیە؛ دەرمەنجێڵە؛ دەر و دیوارێ کە تووڵ و شووڵ و ساقەتەی قامیش دروستی دەکەن.

**چپرو** / čaprow، ـها؛ چپروان čaprovān/: /اسم. *[سیاست]* چەپ‌لا؛ لایەنگری لاسار لە ئەندێشەی چەپدا.

**چپ‌روی** / čapravî، ـها/: /اسم. *[سیاست]* چەپ‌لایی؛ کار یان ڕەوتی لایەنگری لاسارانە لە بیر و بۆچوونی چەپ.

**چپش** / čapeš، ـها/: /اسم. گیسک؛ گێسک؛ چەپیش؛ چەپۆش؛ بەچکە بزنی لە شیر بڕدراو، لە پێنج مانگەوە تا یەک ساڵ.

**چپق** / čopoq، ـها/: [ترکی]/اسم. سەویلە؛ سەبیل؛ سبیل؛ سەبیلە؛ چووخ؛ چپوغ؛ چواک؛ قەندە؛ قەلن؛ قەلنە؛ ئامرازی تووتن کێشان، بە لوولەیێکی چێوی یان کانزایی و سەرێکی وەک فنجانی چکۆلە کە تووتنەکەی تێدەکەن ‹یک چپق چاق کن با هم بکشیم: سەویلەیەک ساز کە پێکەوە بیکێشین›.

⊡ **چپق کسی را کشیدن**: *[کنایی، گفتاری]* کەسێک کێشانە چوارمێخەوە؛ چۆڵە چزێ کەسێک دان؛ خوێن کەسێک کردنە کاسەوە؛ ئەشکنجەکردن یان بە سەختی ئازاردانی کەسێ ‹وقتی بردند چپقت را کشیدند، آن‌وقت معنی حرف مرا می‌فهمی: کاتێ بردتیان کیشاتیانە چوارمێخەوە، ئەو کاتە مانای قسەکانی من دەزانی›.

**چپق‌ساز** / čopoqsāz، ـها/: [ترکی/ فارسی]/اسم. سەبیلچی؛ سەبیل‌ساز؛ کەسێ کە سەبیلی تووتن دروست دەکا.

**چپکی** / čapakî/: قید. *[گفتاری]* لار: ١. لارەلار ‹چپکی رفت: لارەلار ڕۆیشت› ٢. چەوێڵ؛ لەوێر؛ چەوت؛ چەفت؛ خوار ‹کاسە را چپکی گرفت: کاسەکەی لار گرت›.

**چپگرا** / čapgerā، ـها؛ ـیان/: صفت. *[سیاست]* چەپخواز؛ چەپەوگر؛ چەپواز؛ دەستەچەپی؛ لایەنگری گۆڕانکاری لە پێز و بنەمادا بۆ دابین‌کردنی ماف و قازانجی کۆمای خەڵک ‹روزنامەی چپگرا: ڕۆژنامەی چەپخواز›.

**چپگرایی** / čaparāyî/: /اسم. چەپخوازی؛ چەپوازی؛ چەپەوگری؛ دۆخ یان چۆنیەتی چەپخواز بوون.

**چپگرد** / čapgard/ ☜ **چپگردان**

**چپگردان** / čapgardān/: صفت. چەپگەڕ؛ چەپگەرد؛ خاوەن جوولەی دەورەیی بەرەو لای چەپ: **چپگرد**

**چپ‌نمایی** / čapnemāyî/: /اسم. چەپ‌نوێنی؛ کار یان ڕەوتی خۆ وەک هەوادار یان پەیڕەوی ئەندێشە یان هێزگەلی سیاسی چەپخواز نیشاندان. هەروەها: **چپ‌نما**

**چپو** / čapow, čapo/: [ترکی]/اسم. *[گفتاری]* تالان؛ برۆ؛ پوور؛ پوێر؛ چەپۆ؛ چەپاو؛ چەپلاو. هەروەها: **چپو شدن؛ چپوکردن**

**چپه** / čape, čappe/: صفت. گلار؛ چەپ؛ کەوتوو؛ وەرگەڕاو؛ هەڵدرپاگ؛ سەرنخون؛ هۆرویڵیا؛ هۆرداریا؛ لارەوە بووگ ‹ماشین چپه شد

و افتاد توی جوب: ماشینەکە گلار بۆوە و کەوتە نێو جۆگەوە›.

▣ **چپه کردن:** وەرگەڕاندنەوە؛ هەڵەوگەڕاندن؛ قولەوژوورکردن؛ هۆروێلنەی؛ گلارەوەکردن.
هەروەها: **چپه شدن**

**چپی** / čapî ، ـها/: *صفت.* چەپی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە چەپەوە ۲. شوێنکەوتوو یان لایەنگری چەپ؛ چەپخواز ‹روزنامەی چپی: رۆژنامەی چەپی› ۳. *[گفتاری]* هەڵدێراو؛ هەڵەودێریاگ؛ هەڵگەڕاوە؛ وەرگەڕاو ‹ماشین چپی: ماشینی هەڵدێراو›.

**چپیدن** / čapîdan/: *مصدر. لازم. // چپید:* ترنجایت؛ **می چپی:** دەترنجی؛ **بچپ:** بترنجە// ترنجان؛ ترنجیان؛ ترنجیەی؛ تەپین؛ ڕاپۆرین؛ بە زۆر چوونە نێو شتێکەوە؛ بە دژواری جێ بوونەوە ‹چپیدن توی ماشین: ترنجانە نێو ماشێنەوە›.
هەروەها: **چپیدنی**

■ صفت مفعولی: **چپیده** (ترنجاو)/ مصدر منفی: **نچپیدن** (نەترنجان)

**چتائی** / čatā'î/: [؟] ☜ **چتایی**

**چتایی** / čatāyî/: [؟]/*اسم.* گوش؛ هەودا و ڕیشاڵەی ساقەتەی جۆرێ کەنەف کە دە ئاو و هەوای شۆداری گەرمیاندا دەڕوێ، کەمکۆڵیە و زۆرتر بۆ چنینی گۆنی بە کار دێ: **چتائی**

**چتر** / čatr ، ـها/: [سنسکریت]/*اسم.* چەتر؛ چەترە: ۱. کەرەسەیەک لە جنسی پارچەی ئاو نەدەڵێن، کە بە چەند میلەیەکی یەکناوەندەوە لکاوە، لە کاتی باراندا هەڵیدەدەن وەک نیوەگۆیێکی لێ دێ، بەرگری لە تەڕ بوون دەکا ۲. سەیوانە؛ جۆرێ لە هەمان کەرەسە بە ڕەنگی ڕۆشن کە بۆ بەر هەتاو و سێبەر خۆش‌کردن بە کار دەروا: **چتر آفتابی** ۳. جۆرێ گەپتر و پتەوتر لەوە، لە جنسی پارچەی قایم و سووک کە بۆ داپەڕین لە فڕۆکە یان لە جێگای بەرزەوە کەڵکی لێ وەردەگرن: **چتر نجات** ٤. چەپکەی موو یان پەڕ کە بە شێوەی چەتر هەڵدراوەتەوە ‹چتر تاووس: چەتری تاووس› ٥. *[مجازی]* سەیوان؛ سێبەر؛ پارازوو؛ ئەوەی کەسێ یان شتێ دەپارێزێ ٦. *[گیاه‌شناسی]* کلاوە؛ سەری کارگ؛ کلاوەی قارچک.

▣ **چتر آفتابی** ☜ **چتر-۲**
**چتر نجات** ☜ **چتر-۳**

▣ **چتر زدن:** چەترکردن؛ چەتر هەڵدان ‹پرهای زیبای تاووس چتر زده بود: پەڕە جوانەکانی تاووس چەتریان کردبوو›.
**زیر چتر خود گرفتن:** *[مجازی]* دەست بە سەرەوە گرتن؛ خستنە ژێر پەڕ و باڵی خۆ؛ ژێر پەڕ و باڵ گرتن؛ پشتیوانی لێ‌کردن.

**چترباز** / čatrbāz ، ـها؛ ـان/: [سنسکریت/ فارسی] *اسم.* ۱. چەترباز؛ پەڕاشۆتڤان؛ پەرەشووت؛ ئەوەی بە چەتر لە فڕۆکەوە دادەپەڕێ ۲. چەترباز؛ جەنگاوەرێک کە بۆ هێرش بردن لە پشتەوەی سوپای دوژمن بە چەترەوە دادەبەزێ ۳. *[کنایی]* کەسێ کە لە ناکاو و بێ‌بانگهێشتن لە جەژن و میوانی پەیدا دەبێ.

**چتری** / čatrî/: [سنسکریت] *صفت.* چەتری: ۱. پێوەندیدار بە چەترەوە ۲. وەکوو چەتر؛ چەترئاسا.

**چتکه** / čotke, čotge ، ـها/: [روسی]/*اسم.* ۱. چۆرتکە؛ چۆرت؛ ئامرازێ بۆ ژماردن، بە چوارچێوە و میلەگەلێکەوە کە یەکێ ۱۰ مۆرەیان پێوەکراوە و بە جێبەجێ‌کردنی ئەو مۆرەگەلە دەکرێ هەر چوار کاری سەرەکی ژماردن (بەتایبەت لێ‌زیاد کردن و کەم کردنەوە) ئەنجام بدرێ: **چرتکه** ۲. *[گفتاری، قدیمی]* برەو؛ برەو؛ برۆس ‹چتکەی کفش: برەوی کەوش›.

▣ **چتکه انداختن:** ۱. چۆرتکە داخستن؛ چۆرتکە لێدان؛ بە چۆرتکە حەسێب کردن ‹هر چە چتکە انداختم دیدم با حساب من جور در نمی‌آید: هەر

چی چۆرتکەم داخست دیتم لەگەڵ حیسابی مندا یەک ناگرێتەوە› ٢. *[کنایی]* سەنگ و سووک کردن؛ بیرکردنەوە لەمەڕ قازانج و زیانی کارێکەوە.

**چتول** / čatval/: [روسی] *اسم. [قدیمی]* چەتوەل: ١. یەکەی کێشانە بەرانبەر بە ١٢٥ گرەم ٢. یەکەی تراوان (بەتایبەت خواردنەوەی ئەلکولی) بەرانبەر بە ١٢٥ میلی‌لیتر.

**چچن** / čečen/: *اسم.* چیچان؛ چاچان؛ چچن: ١. هۆزی سپی پێستی باکووری قەفقاز (کۆماری چچن) ٢. *ـها/* هەر یەک لە کەسانی ئەو هۆزە.

**چخ** / čex/: *صوت.* چخە؛ چغە؛ وتەیەک بۆ ڕاو نان و دوور کردنەوەی سەگ: **چخە**

**چخ کردن:** چخەکردن؛ چغەکردن؛ دەر کردنی سەگ.

**چخماق** / čaxmāq/: [ترکی] *اسم.* ١. بەردە ئەستێ؛ بەردی ئاگرپژێن؛ بەردەچەخماخ؛ کوچک‌چەخماخە؛ تەوەن چەخماخ؛ ستاوبەر ٢. بەرتفک؛ مقەنەزمە؛ گەڤژال؛ چەخماخی تفەنگ؛ چەکوچ ئاسایەک لە تفەنگدا کە پاڵ بە دەرزیەوە دەنێ، بدا لە چەخماخە.

**چخماقی** / čaxmāqî/: [ترکی] ☜ سبیل چخماقی، **سبیل**

**چخه** / čexe/ ☜ **چخ**

**چدن** / čodan/: [روسی] *اسم.* چودەن؛ ئالیاژی کانزای ئاسن و ٢٪ تا ٤٪ کەربون.

**چرا** / čarā, čerā/: *اسم.* لەوەڕ؛ چێری؛ کار یان ڕەوتی چەرین؛ ئالف دۆزینەوە و لەوەڕانی ئاژەڵ.

**چرا کردن:** لەوەڕان؛ لەوەڕین؛ لەوەڕیان؛ لەوەڕیەی؛ چەرین ‹گوسفندان در پای کوه چرا می‌کردند: مەڕەکان لە بناری کێودا دەلەوەڕان›.

**به چرا بردن:** بردن بۆ لەوەڕگە؛ ڕامەی؛ بردنی ئاژەڵ بۆ لەوەڕگە بۆ لەوەڕاندن ‹هر روز صبح گله را به چرا می‌برد: هەموو ڕۆژێ ڕانەکەی بۆ لەوەڕگە ئەبرد›.

**چرا**[1] / čerā/: *اسم.* چۆناوچۆنی؛ چۆنیەتی؛ چەنیەتی؛ چەینی؛ چەیناوچەینی؛ هۆ؛ سۆنگە ‹چرایش را نپرس!: چۆنیەتیەکەی مەپرسە!›.

**چرا**[2]: *قید.* ١. بۆ؛ بوو؛ بۆچی؛ بۆچە؛ بووچە؛ بۆچ؛ چی؛ لە بەرچی؛ گلۆ؛ چما؛ ژچ؛ بۆ؛ ژچە؛ ژچی، یەی؛ ڕا؛ ڕاچ؛ ڕای؛ ئەڕای؛ ئەڕا؛ ئەڕای چە؛ سی‌چە؛ قەی؛ هما؛ ما؛ ئادی؛ لۆچ؛ لۆ؛ لۆچە؛ لەبۆ؛ لبۆ؛ لەبان‌چە؛ لەل؛ چرا؛ ساچی؛ وەرچە؛ پەی‌چێش؛ پەی چێ؛ وشەی پرسیار لە هۆ، سۆنگە یان هاندەری کارێک ‹چرا رفت؟: بۆچی ڕۆیشت؟› ٢. *[گفتاری]* با؛ بۆچەنە؛ بۆچی نە؛ وڵامی ئەرێنی لە بەرانبەر پرسیاری نەرێنیدا ‹پرسید: آزاد نیامد؟ گفتم: چرا همین الان آمد: پرسی: ئازاد نەهات؟ گوتم: با هەر ئێستا هات›.

**چرائی** / čerā'î/ ☜ **چرایی**

**چراخور** / čarāxor, čerāxor/، ـها/: *اسم.* لەوەڕگا؛ لەوەڕگە؛ جێ‌لەوەڕ؛ چەڕاگە؛ باسەڕە؛ دەشتی گیاجاڕ و جێ‌لەوەڕی باش بۆ ئاژەڵ.

**چراغ** / čerāq/، ـها/: *اسم.* چرا؛ چراو؛ چراوی؛ چراخ؛ لامپا؛ لالە: ١. کەرەسەیەک کە بە سووتانی ماکێکی سووتمانی ڕووناکی بەدی دێنی ‹چراغ توری: چرا تۆڕی› ٢. چرای کارەبا؛ دەزگایەک کە بە هۆی هێزی کارەباوە ڕووناکی بەدی دێنێ ‹چراغ برق: چرای بەرق› ٣. گڵۆپ؛ لامپ ٤. قوتیلە؛ قوتیلکە؛ چراموشی؛ تەژگا (ئوجاق)ی چێشت لێنان.

**چراغ اطمینان:** چرای هەداری؛ جۆرێ چرا تۆڕی تایبەتە بۆ بەرگری لە تەقینەوەی گاز لە کانگەدا بەکار دێ و بە گازی میتانی شوێنەکە دەگرێ.

**چراغ الکلی:** چرای ئەلکولی؛ چرایەک کە بە ئەلکول کار دەکا و زۆرتر وەک تەژگا بە کاری دەبەن.

**چراغ بادی:** فانۆس؛ چرا ئینگلیسی؛

چرانیسی؛ شەمووله؛ کلچان؛ چرای دەستی.
**چراغ برق:** چرای کارەبا؛ چرا بەرق؛ چرایەک کە بە کارەبا (بەرق) ڕۆشنایی دەدا.
**چراغ پیەسوز:** سبێوس؛ دوبە؛ پیفسوچ؛ چرای پیسۆز؛ چرایەک کە بە پیو کاری دەکرد.
**چراغ توری** ☜ **چراغ زنبوری**
**چراغ جادو:** *[مجازی]* چرای جادوو؛ شتێ کە هەموو گیروگرفتێک چارەسەر دەکا.
**چراغ چشمک‌زن:** ترووسکە چرا؛ چرایێک کە بێ وچان ڕۆشن دەبێ و دەکوژێتەوە.
**چراغ خطر:** چرای سوور؛ چرایەک کە ڕووناکیەکەی سوورە و بۆ ڕاگەیاندنی مەترسی بە کار دەڕوا.
**چراغ خواب:** شەوخەف؛ چرا خەو؛ چرایێکی کز کە لە کاتی نووستندا هەڵیدەکەن.
**چراغ خوراکپزی:** چرای چێشت لێنان.
**چراغ راهنما:** چرای ڕێنوێن؛ چرایێک بە گڵۆپلی سوور و زەرد و سەوزەوە بۆ نیشاندانی نۆرەی ڕێکەوتنی پیادە و سوارە لە بوارگەکاندا.
**چراغ زنبوری:** چرا تۆڕی؛ چرا پەمی؛ چرا پەمپی: **چراغ توری**
**چراغ سبز:** چرای سەوز؛ چراسەوز؛ چرایەک کە نیشانەی ئازادی هاتوچووە.
**چراغ قرمز:** چرای سوور؛ چراسوور؛ چرایەک کە نیشانەی مەترسی یان بەسیانی ڕێگەیە.
**چراغ قوه:** چرا قووە؛ لایت؛ جۆرێ چرای دەستی کە بە باتری کاردەکا.
**چراغ کاسەای:** چرا لامپا.
**چراغ گاز:** **چراگاز**؛ تەژگا؛ چرایێ کە بە گاز کاردەکا.
**چراغ گردسوز:** چرای گلسۆز؛ چرایەکی نەفتی بە فتێلەی خڕەوە.
**چراغ مطالعه:** چرای موتالا؛ چرای خوێندنەوە؛ چرایەک بۆ سەرمێزی خوێندن و نووسین کە تیشکەکەی دەکەوێتە سەر کتێب و دەفتەر.
**چراغ موشی:** ۱. قودیلە؛ قوتوولە؛ قوتیلە؛ قوتیللە؛ قەندیلە؛ قەنیلە؛ قوتیلە چرا؛ چرا مووشی؛ چرا مووشینە؛ چرا فتیلە؛ فتیلە چرا؛ قوتیلکە چرا؛ شەمووله؛ قودیک؛ جۆرێ چرای سادە و بچووک و بێ‌شیشە کە دووکەڵی زۆرە و ڕۆشنایی کەم ۲. *[کنایی]* چرای کز؛ چرای کەمڕۆشنایی.
**چراغ مهتابی:** چرای ماتابی؛ لامپێکی لوولەیی کە دیوی ناوەوەی بە ماکێکی سپی درۆشن (فلورسنس) سواخدراوە و برێ هەڵمی جیوەی تێدایە، کە ڕۆشن دەکرێ نوورێکی سپی و مات دەداتەوە.
**چراغ نئون:** لامپ نئون ☜ **لامپ**
**چراغ نفتی:** چرا نەوتی؛ چرا نەوتیە؛ چرایەک کە سووتەمەنیەکەی نەوتە.
▣ **چراغ چشم و دل کسی روشن بودن:** *[مجازی]* چاو و دڵی کەسێک ڕوون بوونەوە؛ چاو و دڵ کەسێ ڕۆشن بوونەوە؛ شاد و بەختەوەر بوون ‹گفتم: چراغ چشم و دلتان روشن که پسرتان آمد: گوتم: چاو و دلتان ڕوون کوڕەکەتان هاتەوە›.
**چراغ زدن:** ۱. چرا لێدان؛ بە هەڵکردن و کوژاندنەوەی چرا، نیشانەدان ‹ماشین عقبی مرتب چراغ می‌زد: ماشێنە دواییەکە لە سەر یەک چرای لێدەدا› ۲. *[کنایی]* چاو قرتاندن؛ چاو قرتانن؛ چاو لێ‌داگرتن؛ چاوەقرتێ‌کردن ‹برای دختر چراغ می‌زد: چاوی لە کچەکە دەقرتاند›.
**چراغ سبز نشان دادن:** *[کنایی]* چرای سەوز لێدان/ نیشان دان؛ نەرم بوون؛ سازان؛ بە شێوەیێ ناڕاستەوخۆ ڕەزامەندی دەربڕین.
**چراغ عمر کسی خاموش شدن:** *[مجازی]* چرای تەمەنی کەسێ کوژانەوە؛ فتیلەی تەمەنی کەسێک لە پتان کەوتن؛ چرا لە سووتان

کەوتن؛ مردن.

**چراغ کسی به پت-پت افتادن:** *[کنایی]* سەری کەسێک لە لێو قەبرەوە لەرزین؛ فتیلەی تەمەنی کەسێ بەرەو کزی چوون؛ لە ئاسانەی مەرگدا بوون.

**به چراغ قرمز برخوردن:** *[کنایی]* تووشی گێرە هاتن؛ قۆڵ لە قەڵبەگیران ‹درست در وسط راه به چراغ قرمز برخوردیم و پولمان تمام شد: ڕاست لە چەقی ڕێگەدا تووشی گێرە هاتین، پارەمان تەواو بوو›.

**چراغان** / čerāqān/: *صفت.* ١. چراخان؛ شەوگڕ؛ به چراگەلی ڕۆشنی زۆرەوە ٢. *[کنایی]* گەشاوە؛ شادمان؛ ڕوون ‹با آمدنت دلم چراغان شد: به هاتنت دلم گەشاوە›.

**چراغانی** / čerāqānî ، ـها/: *اسم.* چراخانی؛ بار و دۆخی چراخان بوون.

◘ **چراغانی شدن:** چراخان‌کران؛ بە هۆی چرای زۆرەوە ڕووناک بوون ‹سراسر کوچه چراغانی شده بود: سەرانسەری کۆڵانەکە چراخان کرابوو›.

**چراغانی کردن:** چراخانی‌کردن؛ چراخان کردن؛ چرای زۆر ڕۆشن‌کردن ‹به مناسبت سال نو شهر را چراغانی کرده بودند: بە بۆنەی ساڵی تازەوە شاریان چراخانی کردبوو›. هەروەها: **چراغانی شدن**

**چراغپا** / čerāqpā/: *اسم.* جامبازە؛ جانبازە؛ چراخپا؛ چەپۆکانە؛ دۆخ یان چۆنیەتی شاخ کردن؛ هەڵبڕینی دوودەست و ڕاوەستانی گیانەوەر بە سەر هەر دوو پێیەوە.

**چراغ‌ساز** / čerāqsāz ، ـها؛ ـان/: *اسم.* چراساز؛ چراوساز؛ کەسێ کە پیشەی چێ‌کرن یان دروست‌کردنەوەی چرایە.

**چراغ‌سازی** / čerāqsāzî/: *اسم.* چراسازی؛ چراوسازی: ١. کاری چراساز ٢. *ـها/* کارگەی چراساز ٣. *ـها/* کارخانەی دروست‌کردنی چرا.

**چراغک** / čerāqak ، ـها/: *اسم.* چراویلکەی ئاگردان کە گەرمایەکی کەمی هەیە و زۆرتر بۆ گەرم ڕاگرتنی چێشت هەڵدەکرێ.

**چراکه** / čerāke/: *حرف. [ادبی]* چونکە؛ چوونکە؛ چوونکوی؛ چونکەی؛ چونکوو؛ چونکا؛ چۆنکاتێ؛ چۆنکە؛ بۆیکان؛ بۆیەکان؛ بۆیەکانێ؛ لەوڕا ‹او نیامد، چراکه می‌دانست گرفتار خواهد شد: نەهات، چونکە دەیزانی تووش دەبێ›.

**چراگاه** / čarāgāh ,čerāgāh ، ـها/: *اسم.* لەوەڕگە؛ لەوەڕگا؛ لەڤەڕنگە؛ چەڕاگە؛ چەڕوگا؛ چێرەگە؛ چایەر؛ چێری؛ باسەڕە؛ یورت؛ وێرت؛ جێ‌لەوەڕ؛ کۆز؛ گادۆڵ؛ مێرگ و بژوێن و گیاجاڕی لەبار بۆ لەوەڕی گیانەوەران ‹باغها ویران شده و به صورت چراگاه دامهای ده درآمده بودند: باخەکان کاول ببوون و کرابوونە لەوەڕگەی مەڕ و مالاتی دێ›.

**چراگشت** / čarāgašt, čerāgašt/: *اسم.* کار یان ڕەوتی گۆڕینی وەرزی لەوەڕگەی ئاژەڵان و بردنیان بۆ لەوەڕگای دیکە.

**- چران** / čarān, čerān/: *پیوازە.* ــ لەوەڕێن؛ -چەڕێن؛ - چەران؛ - چران؛ - چڕان؛ - چەڕان؛ لەوەڕێنەر ‹گاوچران: گالەوەڕێن›.

**چراندن** / čarāndan, čerāndan/: *مصدر. متعدی.* // **چراندی:** لەوەڕاندت؛ **می چرانی:** دەلەوەڕێنی؛ **بچران:** بلەوەڕێنە// لەوەڕاندن؛ چەڕاندن؛ چراندن؛ چڕاندن؛ چەلاندن؛ چرەنن؛ چەڕانن؛ لەوەڕنەی؛ لەوەڕنای؛ گیانەوەر بردنە لەوەڕ، یان لە کاتی لەوەڕیاندا چاودێری لێ کردن ‹گوسفند چراندن: مەڕ لەوەڕاندن› * **چرانیدن.** هەروەها: **چرانیدنی**

■ صفت فاعلی: **چراننده** (لەوەڕێنەر)/ صفت مفعولی: **چرانده** (لەوەڕێنراو)/ مصدر منفی: **نچراندن** (نەلەوەڕاندن)

**- چرانی** / čarānî, čerānî/: *پیوازە.* ــ چەڕێنی؛ ــ چەرانی؛ ــ چرانی؛ ــ چڕانی؛ ــ چەڕانی:
١. ــ چەڕێنی ‹سورچرانی: سوورچەڕێنی›
٢. ــ لەوەڕێنی ‹شکمچرانی: زگ‌لەوەڕێنی›.

**چرانیدن** /čarānîdan, čerānîdan/ ☜ **چراندن**
**چرایـی** / čerāyî/: اسم. [ادبی] چیەتی؛ هـۆ؛ سۆنگە: **چرائی**
**چرب** / čarb/: صفت. چـەور؛ چـەروو؛ چـەرڤ؛ چەرب؛ چەڤر: ۱. خاوەن چەوری ‹گوشت چـرب: گۆشتی چەور› ۲. چـەورچلیک؛ دویـن؛ زومـدار؛ شۆل؛ دهون؛ چـەرم؛ ئاوێتـەی چـەوری ‹دسـت چرب: دەسـتی چـەور› ۳. [مجازی، گفتاری] فـرە؛ مایەدار؛ زۆر یا زۆرتر لە باری چەندیتیەوە ‹گفتم اوستا، زندگی من نمی‌چرخد، کمی مزدم را چرب‌تر کـن!: گوتم ئوسـا، ژیـانم بـەڕێوە ناچـێ، کـەمی مزەکـەم چەورتر کەوە!›. هـەروەها: **چـرب بـودن؛ چـرب شدن؛ چرب کردن**
**چـرب‌آخـور** / čarb'āxor/: اسم. ئاخورچـەور: ۱. ئاخوڕی پڕ لە هەموو جـۆرە خـۆراکی ئـاژەڵ ۲. [کنایی] پەناگای جێ خۆش ڕابواردن.
**چربدسـت** / čarbdast/: صـفت. [کنـایی] بەدەستوبرد؛ دەسـتسـووک؛ دەسـتسـۆک؛ چالاک ۲. [قدیمی] فێلباز؛ ساختەچی.
**چـرب‌زبـان** / čarbzabān/: صـفت. [مجـازی] زمان‌تەڕ؛ دەم‌تەڕ؛ زارنەرم: ۱. بە وتـەی خـۆش؛ قسەخۆش ۲. زمان‌لـووس؛ جۆشـن؛ هولیـسک؛ لیـسکە؛ چـاپبـاز؛ جـاملووس؛ چـەورزمان؛ زمان‌چەور؛ تـەڕزوانی خـۆ ڕێکخـەر. هـەروەها: **چرب‌زبانی**
**چـرب‌وچیلـی** / čarb-o-čîlî/: صفت. [گفتـاری] چەوروچـلـیک؛ چەوروچـلکن؛ پـیس‌وپـەلۆس؛ تێکەڵ بە ڕۆن و چەوری ‹دست چرب و چیلـی‌ات را به در و دیوار نمال: دەستی چەوروچلیکت مەساوە بـە دیوارەکەدا›.
**چرب و نرم** / čarb-o-narm/: صفت. ۱. بـەتام و لـەزەت؛ چـەور و چێـژەدار ‹غـذای چـرب و نـرم: چێشتی بەتام و لەزەت› ۲. [مجازی] چەور و نەرم؛ خۆش و دڵنشین؛ دڵگر ‹زبان چرب و نـرم: زمـانی چەور و نەرم›.
**چربه** / čarbe/: اسـم. ۱. قاقـەز پێـستی؛ کاغـەز مۆمی ۲. تۆژ؛ تۆشک؛ توژی؛ تۆژگ؛ تـوێ؛ تـوە؛ تۆ؛ چەورایی سەر شیر یان تراوانی‌تر.
**چربـی** / čarbî ، ـهـا/: اسم. چـەوری؛ چەرڤـی؛ چەڤری؛ چەربی: ۱. زوهۆم؛ زفر؛ مرت؛ چەرمی؛ زۆن؛ تەواش؛ زەرنووقایی؛ ماکێکی ڕۆنی کـە لـە تینی ئاساییدا گیرساوە ۲. غەز؛ وەز؛ دۆن؛ بـەز؛ چەورایی؛ پی؛ ڕۆنی لەشی گیانـەوەران و تـۆمی بـرێ گیـا (وەک زەیتـوون و گەنمەشـامی و...) ۳. [گفتاری] چێشتی چەور ‹دکتر گفته چربی نخـور: بژیشک گوتوویە چەوری مەخۆ›.
**چربیدن** / čarbîdan/: مـصدر. لازم. [گفتـاری] بـە ملدا چوون؛ زۆرتر/ فرەتر/ بانتر/ زیاتر بـوون؛ لـە سەر بوون؛ بە هەڤیاز بوون؛ چـیر بـوون ‹زور آزاد به آرام می‌چربد: زۆری ئازاد بە مل ئارامدا ئەچێ›.
**چرت** / čert/: اسم. [خیاطی] درزێکی چکۆلە کـە لە کاتی دوورینی کەوانیدا بـە لێـواری پارچـەوە دەیدەن. هەروەها: **چرت‌دادن**
**چـرت** / čert, čart/: صـفت. بـێ‌خـۆ: ۱. قـۆڕ؛ گەزاف ‹حرف چرت: قسەی قۆڕ› ۲. بێ‌هۆ؛ گـۆترە ‹کار چرت: کاری بێ‌خۆ›.
**چرت** / čort/: اسم. خەوەنووچکە؛ خەونووچکـە؛ خەونوچکە؛ خەونیچکـە؛ نوقرشـک؛ نوقورشـک؛ نوقرسک؛ قنگەخـەو؛ چـۆرت؛ چـۆرتم؛ وەنـەوز؛ وەنەوزە؛ هونژەک؛ وەژینگ؛ وێژینـگ؛ وێژنـگ؛ وێژنـە؛ ورینگـە؛ وریـنی؛ بارینـە؛ دلـوف؛ خـەوەکوتکێ؛ هنیـشک؛ خـەو بردنـەوەی زۆر کورت.
▣ **چرت بردن**: خەونووچکە بردنەوە ‹سر کـلاس چـرتش بـرده بـود: لـە نـاو پۆلەکـەدا خەونووچکـە بردبوویەوە›.
**چرت زدن**: ۱. سـەرخەو شـکاندن؛ وەژینـگ دان؛ چـۆرت دان؛ هێـزین؛ وەنـەوزدان؛ چـاو گەرم‌کردن؛ هەڵازنین؛ دلوف دایـن؛ هـونژین؛ سەرەخەوکردن؛ وەنەوزکەردەی ‹تا چای حاضر

شود چرتی بزن: تا چایی ساز دەبێ سەرخەوێ بشکێنە› ۲. وەنەوز بردنەوە؛ خەونووچکە بردنەوە؛ خەوەنیچکە بردن ‹راننده همەاش چرت می‌زد: ڕانەندەکە هەر وەنەوزی ئەدا›.

**چرت کسی پاره شدن:** *[مجازی]* خەوی کەسێ ڕەوین/ زڕان؛ خەو لە چاو/ سەری کەسێ پەڕین؛ خەو کەسێ شکیانە چاوی؛ بە هۆی هەرا و هوریا یان ڕووداوێکەوە لە وەنەوز داچڵەکان ‹با صدای زنگ تلفن چرتم پاره شد: بە زەنگی تەلەفونەکە خەوم زڕا›.

**چرتکه** /čortke/: [روسی] ☜ **چتکه ـ ۱**

**چرت‌وپرت** /čert-o-pert, čart-o-part/: *اسم. [گفتاری]* هەڵیت و پەڵیت؛ هەڵەق ـ مەڵەق؛ هیچ و پووچ؛ قسەی بێ‌مانا ‹چرت و پرت می‌گوید: هەڵیت‌وپەڵیت ئێژێ›.

**چرتی** /čortî/: *صفت.* خەونووچکەیی؛ خەوانی؛ چورتی؛ چۆرتی؛ خاوەن خەو یان وازی وەنەوزدانی زۆر.

**چرچر** /čarčar/: *اسم. [تعریض، گفتاری]* لەوەڕ؛ خۆش‌ونۆش.

◘ **چرچر کردن:** لەوەڕین؛ خۆش‌ونۆش کردن.

**چرچر کسی به راه بودن:** لەوەڕی کەسێک دابین بوون؛ خۆش و نۆشی کەسێ ساز بوون.

**چرخ** /čarx/: *اسم.* چەرخ: ۱. *ـ‌ها/* پێچک؛ تەگەرە؛ لڕ؛ خڕ؛ بازنەئاسایەک کە بە دەوری خولگەیەکەوە دەسووڕێتەوە ‹چرخ ماشین: چەرخی ماشێن› ۲. *ـ‌ها/* کەرەستەیەکی بازنەیی کە بە دەوری ناوەندێکدا سووڕدەخوا ‹چرخ خیاطی: چەرخی خەیاتی› ۳. *ـ‌ها/ [گفتاری]* ئامێری چەرخدار الف) دووچەرخە ‹سوار چرخ بود و می‌رفت: سواری چەرخ ببوو دەڕۆیشت› ب) عەرەبانە ‹چرخ لبوفروشی: چەرخی چۆنەرفرۆشی› ٤. *[ادبی]* گەردوون؛ ئاسمان و هەرچی تێدایە ‹چرخ‌وفلک: چەرخ‌وفەلەک› ٥. *[گفتاری]* چەرخ و خول؛ قەمچ؛ پێچ؛ سوور؛ زڤر؛ جووڵەی سووڕیانی ‹چرخ دادن: چەرخ و خول دان›.

◘ **چرخ اصطکاک:** چەرخێ کە بە نووسان بە چەرخێکی ترەوە، ئەویش دەگەڵ خۆی دێنێتە خول.

**چرخ پایی:** چەرخی پایی؛ ئامێرێکی چەرخدار کە بە پێیان کار دەکا، بەتایبەت چەرخی دروومان.

**چرخ تسمه:** چەرخ سیرم/ سیرمەیی؛ چەرخێ کە کاتی خولانەوەی، تەسمەیەک دەکێشێت و دەبێتە هۆی خولاندنەوەی چەرخێکی‌تر.

**چرخ چاه:** گەردوون؛ چەرخی بیر؛ جەڕجەڕە؛ چەرخی ئاو لە بیر یان چەم دەرهێنان.

**چرخ خیاطی:** چەرخی دروومان؛ ماکێنەی جل دروون کە دەستی، پایی و بەرقیشی هەیە.

**چرخ دستی:** خرخرەک؛ چەرخی دەستی؛ چەرخی دەسی؛ کەرەسەیەکی چەرخدار کە بە دەست کار دەکا.

**چرخ دنده:** چەرخ دەندە؛ چەرخی لێوارە ددانەدار کە لە کاتی خولانەوەدا، ددانەکانی لە ددانەی چەرخێکی‌تر دەگیرێ و ئەویش دەخولێنێتەوە.

**چرخ ریسندگی:** دووکە دووخە؛ گل‌هۆرکەر؛ کەرەسەیەک بۆ ڕێستنی خوری یان پەموو.

**چرخ زاپاس:** چەرخی سپێر؛ چەرخی زاپاس؛ تەگەرەی پێتەکی ماشین.

**چرخ زنجیر:** چەرخ زنجیر؛ چەرخی زنجیر؛ جۆرێک چەرخی دەندەیە کە ئاڵقەگەلی زنجیر لە ددانەکانی دەگیرێ و ئەگەر یەکێکیان کەوتە خول، ئەویکەش دەخولێنێتەوە.

**چرخ غلتکی:** بولبرینگ؛ چەرخێکی چکۆلە لە ژێر کەلپەلی ماڵ و بڕێ کەرستە بۆ بە هاسانی گواستنەوەیان.

**چرخ کوزه‌گری:** چەرخی گۆزەکەری؛

پەڕەیەکی خرکەڵەیە کە لە نێوە ڕاستیەوە میلەیێک دالکاوە، کە دەیخولێننەوە قورەکەش سوور دەدا.

**چرخ گوشت:** چەرخ گۆشت؛ کەرەسەیەکی دەستی یان کارەباییە بۆ ورد و ئەنجن کردنی گۆشت.

⊡ **چرخ دادن:** هەڵسووراندن؛ هەڵسووران؛ سووڕدان؛ چەرخاندن؛ زڤراندن؛ خولدان؛ خولاندن؛ چەرخنەی؛ خولنەی؛ هۆرخولنەی ‹چوب را دور سرش چرخ می‌داد: چێوەکەی بە دەوری سەریدا هەڵدەسووراند›.

**چرخ زدن:** سووڕانەوە؛ هەڵسووڕان؛ خولانەوە؛ چەرخان؛ هۆرخلیەی ‹مثل فرفره چرخ می‌زد: وەکوو فرفرە دەسووراوە›.

**چرخ کردن:** ١. دوورین؛ وراسەی؛ بە چەرخ دووراندن ‹این پیراهن را زود چرخ کن بده اتو کنم: ئەم کراسە زوو بدوورێنە و بیدەوە ئوتووی بکەم› ٢. لە چەرخ دان؛ کردنە چەرخدا؛ چەرخ کردن؛ وردکردن؛ دای چەرخەرە ‹گوشت را چرخ کردم: گۆشتەکەم لە چەرخ دا›.

**چرخ کسی را چنبر کردن:** *[مجازی]* چەرخ لە چەمەر کەسێک کێشان؛ پشوو/ تەنگ لە کەسێ هەڵچنین؛ کەسێک خستنە تەنگانەوە ‹جنگ شد و چرخ ما را چنبر کرد: بوو بە شەڕ و چەرخی لە چەمەرمان کێشا›.

**چرخاب** / čarxāb ، ـها/: *اسم.* ئەو باگرە کە هەوری بارانی پێیە و لە سەر زەریاوە بەرەو بەستێن دەچێ و لە وشکانیدا دایدەبارێنێ.

**چرخان**[1] / čarxān/: *صفت.* چەرخان؛ چەرخمان؛ خاوەن تایبەتمەندی یان توانی سووڕانەوە ‹صندلی چرخان: سەندەڵی چەرخان›.

**چرخان**[2]: *قید.* چەرخمان؛ بە سووڕانەوە ‹گردباد همه چیز را چرخان در هوا می‌برد: گێژەڵووکە هەموو شتێکی چەرخمان لە هەوادا دەبرد›.

**چرخاندن** / čarxāndan/: *مصدر. متعدی.* // **چرخاندی:** هەڵتسووراند؛ **می‌چرخانی:** هەڵدەسوورێنی؛ **بچرخان:** هەڵسوورێنە// هەڵسووراندن؛ سووراندن؛ سووڕانن؛ چەرخاندن؛ چەرخنەی؛ چەرخنای؛ گێژ داین؛ خولەو داین؛ لەرن؛ لۆڕین؛ لروونن؛ لردیە: ١. وەرچەرخاندن؛ زڤراندن؛ وەرگەڕاندن؛ خولاندنەوە؛ خول پێدان؛ هۆرخولنەی؛ خولنایوە؛ شتێ بە دەوور خولگەیەکەوە بزواندن ‹چرخ را چرخاندن: چەرخ هەڵسووراندن› ٢. *[کنایی]* بەڕێوەبردن؛ گەڕاندنی شتێ ‹کار را چرخاندن: کار هەڵسووراندن› ❋ **چرخانیدن.** هەروەها: **چرخاندنی**

■ صفت فاعلی: **چرخاننده** (هەڵسوورێنەر)/ *صفت مفعولی:* **چرخانده** (هەڵسوورێنراو)/ *مصدر منفی:* **نچرخاندن** (هەڵنەسووراندن)

**چرخانیدن** / čarxānîdan/ ☜ **چرخاندن**

**چرخبال** / čarxbāl ، ـها/: *اسم. [نامتداول]* باڵفڕ؛ کۆپتەر؛ هەلیکۆپتر.

**چرخدار** / čarxdār ، ـها/: *صفت.* چەرخدار؛ بەچەرخ ‹صندلی چرخدار: سەندەڵی چەرخدار›.

**چرخدوزی** / čarxdûzî/: *اسم.* ١. چەرخدووری؛ دروومان بە چەرخی خەیاتی ٢. ـها/ چەرخکاری؛ جۆرە دروومانێکی جوانکاریە.

**چرخریسک** / čarxrîsak ، ـها/: *اسم.* جرجرە؛ شەلوورە؛ گۆرەویچنە؛ گۆرێچنە؛ دووکەرێسە؛ دووکەرێسما؛ باڵندەیێکی وردیلەی جوان و دوو ڕەنگی دارژیە، پەڕێکی نەرم و تووکئاسای هەیە: **چلەریسک**

**چرخ زنان** / čarxzanān/: *قید.* بە سووڕانەوە ‹بچەها چرخزنان آمدند: منداڵان بە سووڕانەوە هاتن›.

**چرخش** / čarxeš ، ـها/: *اسم.* چەرخان: ١. لرسە؛ کار یان ڕەوتی خولانەوە؛ زڤرین؛ زڤرین؛ سووڕانەوە بە دەور تەوەرەیەکدا ‹چرخش چرخ: چەرخانی چەرخ› ٢. *[مجازی]* کار یان ڕەوتی وەرچەرخان و گۆڕانی خواست و گەڕ ‹در سیاست خارجی چرخش

آشکاری دیده می‌شود: لە سیاسەتی دەرەوەییدا چەرخانێکی ئاشکرا دەبیندرێت›.

**چرخشت** / čarxošt ، ـها/:اسم. پێگووش؛ هەر یەکە لە کەرەسەگەلی دەستی جۆراوجۆر کە بۆ گرتنی ئاوی میوە دروست کراون.

**چرخشنما**/ čarxešnemā/:اسم. ژیرۆسکۆپ؛ کەرەسەیەکی چەرخئاسایە کە وا دروست کراوە تەخت لە سەر زەوی بنیشێ و بەدەوری خۆیدا سوور بخوا و ئامرازێک وا لە سەریەوە دانراوە، بە هەر لایەکدا پێویست بێ، بگەڕێ و بخونجێ.

**چرخشی** / čarxešî/: صفت. چەرخانی؛ هەڵسووڕانی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە هەڵسووڕانەوە ۲. سووڕێنەرەوە؛ هەڵسووڕێن.

**چرخ‌فلک** / čarxefalak, čarx-o-falak ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. چەرخوفەلەک؛ گەردوونە؛ ماینچەقەڵ؛ کەرەسەیێ بۆ ڕابواردن بە بڕێ سەندەڵیەوە کە خەڵک لە سەری دادەنیشت و بە دەوری خولگەیێکی ئاسۆیی یان کۆڵەکەییدا دەخولێتەوە ‹بچه‌ها چرخ‌فلک سوار شدند: منداڵەکان چەرخ و فەلەک سوار بوون›.

**چرخک** / čarxak ، ـها/:اسم. چەرخ؛ ویلچر؛ سەندەڵی چەرخدار.

**چرخکار** / čarxkār ، ـها/:اسم. چەرخکار؛ کەسێ کە بە چەرخی دروومان کار دەکا.

**چرخکاری** / čarxkārî/:اسم. چەرخکاری: ۱. کار و ڕەوتی کارکردن بە چەرخ بەتایبەت مەکینەی دروومان ۲. کاری دووراندنەوە بە مەکینەی دروومان بە تایبەت ڕازاندنەوەی جل و بەرگ ‹لبه‌ی آستین را چرخکاری کن!: لێوارەی قۆڵەکە چەرخکاری بکە!›.

**چرخ کرده** / čarxkarde/: صفت. قیمە (بۆ گۆشت)؛ چەرخکراو؛ ئەنجنراو بە چەرخ ‹گوشت چرخ‌کرده: گۆشتی قیمە›.

**چرخنده** / čarxande ، ـها؛ ـگان/: صفت. گەڕۆک؛ بە هەڵسووڕانەوە ‹یک میله چرخنده دارد که دوک را می‌چرخاند: میلەیەکی گەڕۆکی هەیە کە تەشیەکە خول دەدا›.

**چرخه**[1] / čarxe ، ـها/:اسم. سوور؛ چەرخە: ۱. سوورە؛ خول؛ چەرخ؛ قەدوەشت؛ مەودای کاتیەک کە زنجیرەی ڕووداوان یان دیاردەگەلێکی تێدا پەیتا۔ پەیتا دەگوورن (وەک سووری ژیان کە بریتیە لە: لە دایک بوون، گەشکەیی، پێگەیشتن، پیری و مەرگ) ۲. دوا بە دوای یەک زنجیرە ڕووداو یان ڕووداوی دووپاتەوە بوو، لە خاڵێکەوە تا دێتەوەسەر هەمان خاڵ (وەک سووری ئاو کە لە گەرمادا دەبێتە هەڵم و هەور و جارێکی‌تر لە بەر سەرما دەبارێتەوە سەر زەوی).

▣ **چرخه‌ی سلولی**:/زیست‌شناسی/ خولی خان؛ خولی داگەڕانێ کە لە مەودای ژیانی خانکێکی زیندوودا ڕوو دەدا.

**-چرخه**[2]: پیواژه. ـچەرخە؛ ئامرازی خاوەن چەرخ ‹دوچرخه: دووچەرخە›.

**چرخه‌ای** / čarxe'î/ ☜ **چرخه‌وار**

**چرخه‌وار** / čarxevār/: صفت. چەرخەسا؛ چەرخەئاسا؛ چەرخەمان؛ لە بیچم یان چۆنیەتی چەرخ: **چرخه‌ای**

**چرخی**[1] / čarxî ، ـها/:اسم. چەرخی: ۱. کەسێ کە سواری دووچەرخەیە ۲. کەسێ کە بە چەرخی دەستی کار دەکا.

**چرخی**[2]: صفت. ۱. گرد؛ گرۆڤەر؛ خڕ؛ خرت ‹پایین دامن را چرخی ببر!: خوارووی داوێنەکە گرد ببڕە!› ۲. چەرخی؛ چەرخکراو؛ بەچەرخ؛ دووراو ‹دوخت چرخی: تەقەڵی چەرخی›.

**چرخیدن** / čarxîdan/: مصدر. لازم. // **چرخیدی:** سووڕاییەوە؛ **می‌چرخی:** دەسووڕییەوە؛ **بچرخ:** بسووڕەوە// سووڕانەوە؛ خولانەوە؛ هەڵسووڕان؛ هەڵسووڕیان؛ هەڵسووڕین: ۱. سووڕان؛ چەرخان؛ خولیانەوە؛ سووڕدان؛ خول‌خواردن؛

گردان؛ زڤران؛ چەرخین؛ چەرخیان؛ چەرخیای؛ پلانن؛ چەرخ دان؛ چەرخخواردن؛ خڕخواردن؛ لرخواردن؛ لرهواردن؛ هۆرگیلای؛ وەرسووڕان؛ وەرچەرخان؛ جوولانەوە بە دەور خولگەیەکدا ‹چرخیدن چرخ: هەلسووڕانەوەی چەرخ› ٢. پێچ دان؛ خرخواردن؛ وەرسووڕان؛ بە دەور شتێکدا گەڕان ‹دور اتاق چرخیدن: هەلسووڕانەوە بە دەوری هۆدەدا› ٣. گەڕان؛ گێلای؛ بەڕێوەچوون و گەڕیانی کار یان کارگەلی بنکەیەک ‹بی من کار این مغازه نمی‌چرخد: بەبێ من کاری ئەم دووکانە هەلناسووڕیت› ٤. *[کنایی]* به بێ ئامانج بەم لا و بەو لادا هاتن و چوون ‹این قدر بی‌خود نچرخ: ئەونده بێخۆ هەلمەسووڕەوە›. هەروەها: **چرخیدنی**
■ صفت فاعلی: **چرخنده** (هەلسووڕێن)/ صفت مفعولی: **چرخیده** (هەلسووڕاو)/ مصدر منفی: **نچرخیدن** (هەلنەسووڕان)

**چرد** / čard ، ـها/: *اسم. [معماری]* دەرگانە؛ جێی دانانی چوارچێوەی درگا.

**ـچرده** / čarde, čorde/: *پیوازه.* ـکار؛ ـچار؛ هوول؛ هووله؛ ڕەنگ؛ ڕەنگی پێست ‹سیاه‌چرده: ڕەش‌کار›.

**چرس** / čars/: *اسم.* چەرس؛ گراس؛ ماکی سرکەری وەبەرهاتوو لە شادانە.

**چرغ** / čarq ، ـها؛ ـان/: *اسم.* بالەوان؛ بالەبان؛ باشە؛ باشووک؛ باشووکە؛ واشە؛ باشوو؛ نورمتە؛ لاچین؛ سەقر؛ چەرخ؛ مەلێکی ڕاوکەری بچووکە چۆلەکە دەگرێ.

**چرغول** / čarqûl/ ☜ **بارهنگ‌ـ١**

**چرک**[1] / čerk ، ـها/: *اسم.* چلک: ١. کێم؛ زووخ؛ خوور؛ گەمەڕ؛ چرک؛ هەوکێم؛ لەیم؛ کێخ؛ ئاشۆ؛ زیچک؛ زنچک؛ لەیم و لیشە؛ تەوشێکی زۆرتر زەرد و برێ جار خوێناوی کە لە برێ برینەوە دەردێ ‹انگشتم چرک کرده: قامکم چلکی کردووە› ٢. گەمار؛ قرێژ؛ چەپەلی؛ لێش؛ لێشک؛ کرێژ؛ تۆز و خۆلی تێکەڵ بە چەوری کە لە شتی‌تر دەئالێ ‹چرک و کثافت خانه را برداشته: چلک و پیسی مالەکەی داگرتووە›.

◘ **چرک زخم:** چرک؛ زنچک؛ زیچکاو؛ زینکاو؛ زامەت؛ زامت؛ زیچک؛ لیم؛ نێم؛ کێم؛ زووخ.

**چرک گوش:** کلمش؛ چلکی ناو گوێ.

**چرک**[2]: *صفت.* چلکن؛ پیس؛ چەپەل؛ چەپەڵ و چەپلاخ؛ کۆتی ‹یقه‌ی پیراهنت چرک است: ملیوانی کراسەکەت چلکنه›.

◘ **چرک بودن:** چەور و چلکن بوون.

**چرک شدن:** پیس بوون؛ چەپەڵ بوون؛ هەڕمین؛ لەوتین.

**چرک کردن:** ١. کێم‌کردن؛ هەوکێم کەردەی؛ چلک‌کردن بە هۆی هورووژمی باکتریەوە ٢. پیس‌کردن؛ چەپەڵ‌کردن؛ چلکن‌کردن؛ سەنماندن؛ لەوتاندن.

**چرکاب** / čerkāb/: *اسم.* ١. چلکاو؛ زیرگاو؛ سیانکه؛ ئاوێ کە شتێکی چلکنیان تێدا شۆردبێتەوە ٢. زووخاو؛ زینچک؛ زنچک؛ زینچکاو؛ زنچکاو؛ شڕ؛ کێماو؛ هەوکێم؛ کێم و زووخ؛ ئاوێ کە لە زامی کێم کردوو دەدەلێ.

**چرکالود** / čerkālûd/: *صفت. [ادبی]* پیس؛ چەپەڵ؛ گەمار؛ پیس و چلکن؛ پلۆخ.

**چرکتاب** / čerktāb ، ـها/: *صفت.* چلکتاو؛ چلک‌هەلگر؛ به ڕەنگی ڕەش و شین و بۆر کە چلکیان پێوە دیار نەبێ (زیاتر بۆ جلک و قوماش دەگوترێ) ‹لباس کار بهتر است چرکتاب باشد: جل‌وبەرگی کار باشترە چلکتاو بێ›.

**چرکزا** / čerkzā/: *صفت.* چلکەزێ؛ چلکێنەر؛ بە توانایی وەبەرهێنانی چلک.

**چرکس** / čarkas/: *اسم.* چەرکەس: ١. هۆزی سپی پێستی قەراخی زەریای ڕەش و باکووری قەفقاز ٢. ـها؛ ـان/ هەر یەکە لە کەسانی سەر بەو هۆزە.

**چرکمرده** / čerkmorde/: *صفت.* چلکەسوو؛

چلکەسۆ؛ چلکشۆر؛ چلکمردوو؛ چلکمردە؛ چلکمریا؛ بە ڕەگ و تەشکی چلکن بە هۆی باش نەشۆردنەوە ‹این پیراهن چرکمرده شده، قابل استفاده نیست: ئەم کراسە چلکەسوو بووە، بە کار نایە›.

**چرکنویس** / čerknevîs ، ـها/: اسم. پێشنووس؛ ڕەشنووس؛ چلکنووس؛ ڕەشەک؛ پیسنووس؛ پێشنووسێ کە پێویستی بە چاوپێدا خشاندن، هەڵەگری و پاکنووس کردن بێ ‹چرکنویس مقاله را برده همانطور چاپ کرده است!: پێشنووسی وتارەکەی بردووه هەر بەو جۆره چاپی کردووه!›.

**چرکی**[1] / čerkî/: اسم. چلکنی؛ پیسی؛ گەماری؛ پۆخڵی؛ چەپەڵی؛ دۆخ یان چۆنیەتی چلکن بوون ‹پیراهن به این چرکی را می پوشی؟!: کراسی بەم چڵکنیه لە بەر دەکەی؟!›.

**چرکی**[2]: صفت. کێمدار؛ هەوادار؛ چلکن ‹زخم چرکی: برینی کێمدار›.

**چرکین** / čerkîn/: صفت. [ادبی] ١. چلکن؛ گەمار؛ پیس؛ پۆخڵ؛ کوتی؛ چلووک؛ چرکن؛ چەپەڵ؛ پەچەڵ؛ پلک؛ پلشت؛ چلیک؛ لیشکن؛ ئاشوو؛ پەلەشت؛ لیتۆکە؛ لیمن؛ پەلۆخ؛ کرێژاو ‹جامەی چرکین: جلی چلکن› ٢. چلک کردوو؛ زووخدار؛ بە زووخ و هێم ‹زخم چرکین: برینی چلک کردوو›.

**چرم** / čarm/: اسم. چەرم؛ ئاڤار؛ خام؛ خار؛ گووێن؛ پێستی گیانەوەری چوارپێ یان خزۆک کە بۆ نەرم و پتەوتر بوونەوە خۆشە دەکرێ.

▣ **چرم ساغری**: کەوڵ؛ کەڤل؛ چەرمێ کە لە پێستی کولۆکی کەر یان ئەسپ ساز دەبێ: **ساغری**

**چرم مصنوعی**: چەرمی دەستکرد؛ هەر کام لە دەیان جۆر بەرهەمی پیشەسازی کە لە ماکی نەوتی دروست دەکرێ و لە چەرمی سروشتی دەکا.

**چرمسازی** / čarmsāzî/: اسم. چەرمسازی: ١. کار یان ڕەوتی دروستکردنی چەرم ٢. ـها/ کارگای دروست کردنی چەرم.

**چرمه** / čarme/: اسم. چەرمی؛ چەرمە؛ بارەبەری سپی (وەک هەسپ، قاتر، کەر) ‹اسب چرمه: ئەسپی چەرمی›.

**چرمی** / čarmî/: صفت. چەرمی: ١. چەرمینە؛ چەرمین؛ دروستکراو لە چەرم ‹کفش چرمی: کەوشی چەرمی› ٢. وەکوو چەرم ‹برگ چرمی: بەرگی چەرمی›.

**چرمین** / čarmîn/: صفت. [ادبی] چەرمینە؛ چەرمین.

**چرند** / čarand/: صفت. جرنا؛ بێمانا؛ بێتام و بنشڕ؛ هەڵیتە؛ قسەی قۆڕ؛ قسەی مفت ‹حرف چرند: قسەی جرنا›.

**چرند و پرند** / čarand-o-parand ، ـها/: اسم. هەڵیتوپەڵیت؛ هاتەران پاتەران؛ پەرتوپەلا؛ توڕڕەهات؛ جەفەنگ؛ قسەی بێناوەڕۆک یان بێ بەر و دوا ‹خیلی چرندوپرند می گفت: زۆر هەڵیتوپەڵیتی دەڕست›.

**چرنده** / čarande ، ـها؛ ـگان/: صفت. گیاخۆر؛ ئالفخوەر؛ چەرنتە؛ بە خوو یان تایبەتمەندی لەوەڕینەوە.

**چرنده و پرنده** / čarande-vo-parande/: اسم. جووقەوار؛ جڕ و جانەوەر؛ هەموو گیانلەبەران.

**چرندیات** / čarandîy(y)āt/: (!) [فارسی/ عربی] اسم. توڕڕەهات؛ فلتەفلت؛ قسەگەلی بێتام؛ وتەگەلی بێمانا، گۆترە یان بێکەڵک ‹کسی به این چرندیات گوش نمی‌دهد: کەس بەم توڕڕەهاتە گوێ نادا›.

**چروک** / čurûk, čorûk ، ـها/: اسم. لۆچ؛ چرچ؛ چرچولۆچ؛ کوریشک؛ گنج؛ قرچ؛ کورژ؛ کورس؛ خورناچین؛ قەرمچ؛ پووکاو؛ لووچ؛ شوێنەوارێک کە بە هۆی نارێکی یان چین خواردنی ماکێکی

نەرم، بە سەریەوە دەمێنێ ‹روی زمین ننشین لباست چروک می‌شود: لە سەر زەوی دامەنیشە جل‌وبەرگەکەت لۆچ دەبێ›.

▣ **چروک برداشتن/ خوردن/ شدن:** لۆچ بوون/ تێکەوتن؛ چرچ بوون/ تێکەوتن؛ لۆچ خواردن؛ لووچ کەفتن؛ ناساف بوون. هەروەها: **چروک کردن**

**چروکیدن** / čurûkîdan, čorûkîdan/: *مصدر. لازم.* چرچیان؛ چرچان؛ هەڵچرچان؛ چرچ بوون؛ هەڵقرچان؛ ژاکان؛ چرچ هەلاتن؛ گرنژین؛ چرچ و لۆچ بوون؛ قەرمچین؛ قرچ هەلاتن؛ چرچ و لۆچ تێ‌کەوتن؛ چەرمقین؛ لۆچان؛ چوونە یەک ‹چروکیدن پوست: چرچیانی پێست›.

■ صفت مفعولی: **چروکیده** (چرچاو)/ مصدر منفی: **نچروکیدن** (نەچرچان)

**چروکیده** / čurûkîde, čorûkîde/: *صفت.* چرچ؛ لۆچ؛ چرچاو؛ هەڵچرچاو؛ کرژ؛ چرچ و لۆچ؛ قرمچی؛ قەرمچی؛ چرچیاگ؛ چەرمقی؛ چرچ هەڵگەڕاو ‹پوست چروکیده: پێستی چرچ›.

**چریدن** / čarîdan, čerîdan/: *مصدر. متعدی.* // **چریدی:** لەوەڕیت؛ **می چری:** دەلەوەڕێ؛ **بچر:** بلەوەڕە// لەوەڕان؛ لەوەڕین؛ لەوەڕیان؛ چەرین؛ چێرین؛ چەڕان؛ چەران؛ چریاین؛ چنێرین؛ لەوەڕیەی: ۱. دەمدان؛ گیا و ئالف خواردنی ئاژەڵ لە لەوەڕگادا ۲. *[مجازی]* زگ لەوەڕان؛ سک بەردان. هەروەها: **چریدنی**

■ صفت فاعلی: **چرنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **چریده** (لەوەڕاو)/ مصدر منفی: **نچریدن** (نەلەوەڕین)

**چریک** / čerîk، ـها؛ ـان/: [ترکی]/*اسم.* چریک؛ پارتیزان؛ شەڕکەری داوخواز کە بە شێوەی تاکەکەسی یان لە دەستەگەلی گچکەدا پەلامار دەبەن و دەپەرژێنە سەر کار و ڕەهاتی وێرانکاری و شەڕ.

**چزاندن** / čezāndan/: *مصدر. متعدی. [گفتاری]* // **چزاندی:** چزاندت؛ **می‌چزانی:** دەچزنی؛ **بچزان:** بچزنە// چزاندن؛ چزنەی؛ وەزەنەی؛ ئازاردان؛ ئازاندن؛ داغ پێوەنان ‹از چزاندن مادرشوهرش لذت می‌برد: حەزی لە چزاندنی خەسووی بوو›.

■ صفت مفعولی: **چزانده** (چزێنراو)/ مصدر منفی: **نچزاندن** (نەچزاندن)

**چس** / čos/: *اسم. [مستهجن]* ۱. تس؛ فس؛ سیک؛ واولەی؛ بایەکی بۆگەن کە بێ‌دەنگ لە ڕیخۆڵەوە فت دەبێ ۲. *[تعریض]* حیزە؛ فشە؛ حیزهەڵمەت؛ بێ‌بایەخ؛ چڵەکا؛ چڵەپۆش؛ شتی چرووک و بێ‌نرخ (بەتایبەت بە شێوەی پێشوشە) ‹چس غصه: حیزە خەم›.

**چسان‌فسان** / čosānfesān/: *اسم. [تعریض]* لاولووسکە؛ لاولووسە؛ ئاڕایشتی تۆخ (بەتایبەت لە ژناندا).

▣ **چسان‌فسان کردن:** لاولووسکەکردن؛ لاولووسەکردن ‹خواهرهای داماد خیلی چسان‌فسان کرده بودند: خۆشکەکانی زاوا زۆر لاولووسکەیان کردبوو›.

**چسب** / časb، ـها/: *اسم.* زامق؛ چەوس؛ زانق؛ زانقی؛ نووسەکی؛ چەسپ؛ چەسب؛ لک؛ ماکێ کە دوو شت پێکەوە دەلکێنێ.

▣ **چسب اسکاچ:** چەسپی نەواری.

**چسب اُوهُو:** چەسپی ئۆهۆ؛ ناوی بازرگانی جۆرە چەسپێکی تەڕە لە بەر هەوادا وشک و پتەو دەبێتەوە.

**چسب دوقلو:** چەسپی دوانە؛ چەسپ دووقلوو؛ جۆرێک چەسپی بە شێوەی دوو بەستەی جیاوازە کە لە کاتی کەڵک لێوەرگرتندا دەبێ تێکەڵ بکرێن.

**چسب زخم:** چەسپی زام؛ چەسپی برین.

**چسب ماتیکی:** چەسپی ماتیکی؛ ماکێکی چەسپدارە لە نێو لوولەیەکدا، وەک ماتیک دەیساون بەو شوێنەدا کە پێویستە چەسپ بکرێ.

**چسبان** / časbān/: *صفت.* ۱. دۆچن؛ لۆچن؛

چەسپن؛ نووس ٢. چەسپ؛ زۆر تەنگ یان کپ.
**چسباندن** / časbāndan/: مصدر. متعدی. // **چسباندی:** چەسپاندت؛ **میچسبانی:** دەچەسپێنی؛ **بچسبان:** بچەسپێنە// چەسپاندن؛ چەسپانن؛ چەسپنەی؛ لکاندن؛ لکانن؛ لکنەی: ١. نووساندن؛ دانی ڕوویەک لە شتێ بە ڕووی شتێکی‌تردا وا کە نێوانیان نەکەوێ ‹صورتش را چسباند به دیوار: دەم و چاوی چەسپاندە دیوارەکەوە› ٢. پێوە نووساندن؛ زەلیقاندن؛ لکاندنی دوو شت بە هۆی ماکی چەسپدارەوە ‹تکەهای کاغذ را بە هم چسباند: لەتە کاغەزەکانی پێکەوە چەسپاند› ٣. پێوە لکاندن؛ پێوەنان؛ پوەوە نیەی؛ تۆمەت یان بۆختان‌کردن بۆ کەسێک ‹جرم سیاسی را به او چسباندند و گرفتارش کردند: تاوانی سیاسیان پێوەلکاند و تووشیان کرد› ٤. بۆ ئامانجێکی (زۆرتر ناڕەوا) لەگەڵ کەسێک یان شوێنێک هات‌وچۆ دامەزراندن ‹خودش را به ما چسباند آمد توی گروه: خۆی پێمانەوە لکاند و هاتە نێو کۆڕەکەوە› * **چسبانیدن**. هەروەها: **چسپاندنی**
■ صفت مفعولی: **چسبانده** (چەسپێنراو)/ مصدر منفی: **نچسباندن** (نەچەسپاندن)
**چسبانیدن** / časbānîdan/ ☜ **چسباندن**
**چسبدار** / časbdar/: صفت. چەسپدار؛ خاوەن ماکێ کە بلکێت ‹سر پاکت چسبدار است: سەری پاکەتەکە چەسپدارە›.
**چسبزا** / časbzā/: اسم. سرێش؛ ستووک؛ ماکێکی چەسپدارە لە ئێسکدا کە بە کولاندنی زۆری لە ئاودا، ڕینگ و ڕیواڵ بەر دەدا و دەبێتە چەسپێکی سروشتی.
**چسبناک** / časbnāk/: صفت. ١. نووسەک؛ چەسپناک؛ زامقی؛ کلێن؛ لچ؛ نووس؛ نیس؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی چەسپاندن ‹مادەی چسبناک: ماکی نووسەک› ٢. دۆچن؛ لۆچن؛ چەسپاوی؛ نووچ؛ ئالاو بە ماکێکی نووسەکەوە ‹دستم چسبناک است: دەستم دۆچنە›.
**چسبندگی** / časbandegî، ـها/: اسم. ١. نیسی؛ دیسی؛ چۆنیەتی نووسەک بوون ٢. خەستی؛ خەسی؛ هەسی.
**چسبنده** / časbande/: صفت. دەبیش؛ نووسەک؛ نویسەک؛ چەسپناک؛ کلێن؛ دۆچن؛ لۆچن.
**چسبی** / časbî/: صفت. دۆچن؛ چەسپاوی؛ نووچ ‹دستم چسبی است: دەستم دۆچنە›.
**چسبیدن** / časbîdan/: مصدر. لازم. متعدی. // **چسبیدی:** چەسپایت؛ **میچسبی:** دەچەسپی؛ **بچسب:** بچەسپە// چەسپان؛ چەسپیەی: ☐ لازم. ١. لکان؛ لکیان؛ لکەی؛ لکای؛ نووسان؛ لەگەڵ شتێکدا بە تەواوی پێکەوە تەقین ‹بە دیوار چسبیدن: بە دیوارەوە چەسپان› ٢. لکان؛ لکەی؛ بە هۆی ماکێکی چەسپناکەوە بە شتێکەوە نووسان ‹به دست چسبیدن: بە دەستەوە لکان› ٣. نووسان؛ چلکیان؛ خۆش یان لەباو بوون ‹ناهار بە من چسبید: فراوینەکە بە دڵمەوە نووسا› ٤. *[کنایی]* لکان؛ بەردەوام بوون؛ پێداگرتن و لە سەر شتێک ڕۆیشتن ‹او به عقاید قدیمی خودش چسبیده است: ئەو لکاوە بە بڕوا کۆنەکانیەوە› ٥. بە پشوودرێژی شوێن کارێ کەوتن و دەست لێ بەرنەدان ‹به درس و مشق چسبیدن: چەسپان بە دەرس و مەشقەوە› ☐ متعدی. ٦. *[گفتاری]* چەسپان؛ چەسپیان؛ بە دەست سفت‌گرتن ‹محکم میله را چسبیده بود: توند بە میلەکەوە چەسپابوو› ٧. *[مجازی]* لکان؛ نووسان؛ دوقەلانک بوون؛ دوقدوقک بوون؛ هەمیشە لەگەڵ کەسێکدا بوون و لێی نەبڕان ‹این بچه به من چسبیده و نمی‌گذارد به کارم برسم: ئەم منداڵە لکاوە پێمەوە و ناهێڵێ کارەکانم بکەم›. هەروەها: **چسبیدنی**
■ صفت فاعلی: **چسبنده** (چەسپێن)/ صفت مفعولی: **چسبیده** (چەسپاو)/ مصدر منفی: **نچسبیدن** (نەچەسپان)
**چست** / čost/: صفت. *[ادبی]* چوست؛ چست؛

گورج؛ فرز؛ چەلەنگ؛ سرت؛ تاشک؛ مەزبووت؛ خێرا؛ بەکار؛ توند؛ چابک؛ چالاک؛ چوختی؛ جەلد؛ قەشقە؛ قۆچاخ؛ قۆچاغ؛ لەش‌سووک؛ میجک؛ تون‌وتۆڵ.

**چستی** / čostî/: *اسم. [ادبی]* چالاکی؛ فرزی؛ چەلەنگی؛ جەختی؛ مەزبووتی؛ خێرایی؛ چوستی؛ گورج و گۆلی؛ توندوتۆلی.

**چسخور** / čosxor ، ـها/: *صفت. [مستهجن]* گووشکەوکەر؛ ڕژد؛ دەستقووچاو؛ دەس‌قووچیاگ؛ چرووک؛ وشکە هەوەڕ.

**چسخوری** / čosxorî ، ـها/: *اسم. [مستهجن]* گووشکەوکەری؛ ڕژدی؛ چرووکی؛ دەس‌قووچیاگی؛ دەست قووچاوی؛ وشکە هەوەری؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕژد بوون.

**چس‌فیل** / čos(e)fîl ، ـها/: *اسم. [مستهجن، گفتاری]* سەرداری؛ برێشکەی گەنمەشامی؛ نوقلەکوردی.

**چس‌نفس** / čosnafas/: [فارسی/ عربی] *صفت. [مستهجن]* قسەفرەکەر؛ فرەوێژ؛ درێژدادڕ؛ زۆربلێ؛ چەنەباز؛ وڕاج؛ چەناکەدەر.

**چس‌نفسی** / čosnafasî ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم. [مستهجن]* درێژدادڕی؛ زۆربلێیی؛ فرەبێژی؛ چەنەبازی؛ وڕاجی؛ چەناکەدەری؛ قسەفرەکەری.

**چسو** / čosû ، ـها/: *صفت. [مستهجن، گفتاری]* ١. تسن؛ تسنە؛ تسکەنە؛ تسکەن؛ فسۆک؛ خۆگرتوو بە تس بەردان ٢. کەلەزات؛ ترسەنۆک؛ ترسەزاڵ؛ ترسەزاور ٣. ڕێخن؛ مەڕمووکە؛ کز و نزار؛ لاواز؛ لە دەس و پا کەوتوو.

**چسی** / čosî/: *اسم. [مستهجن، گفتاری]* ١. فشە؛ بافشە ٢. باگوڕەشە؛ هەڕەشەی بن شڕ.

⊡ **چسی آمدن**: ١. فشەکردن ‹برای ما چسی می‌آمد: فشەی بۆ دەکردین› ٢. باگوڕەشە کردن ‹بیخود چسی نیا! کسی از تو نمی‌ترسد: بێخۆ باگوڕەشە مەکە! کەس لێت ناترسێ›.

**چسیدن** / čosîdan/: *مصدر. لازم. [مستهجن]* // **چسیدی**: تسیت؛ **می‌چسی**: دەتسی؛ **بچس**: بتسە// تسین؛ تسان؛ تسەی؛ تسای؛ تس بەردان؛ فسین؛ فسیان؛ فس‌کردن؛ تس‌کەندن؛ تس‌دان؛ تس کەنتەی.

■ مصدر منفی: **نچسیدن** (نەتسین)

**چش** / čoš/ ☜ **هش**

**چشائی** / češā'î, čašā'î/ ☜ **چشایی**

**چشاندن** / češāndan, čašāndan/: *مصدر. متعدی.* // **چشاندی**: چێژاندت؛ **می‌چشانی**: دەچێژێنی؛ **بچشان**: بچێژێنە// چێژاندن: ١. پێ‌مێلاک‌کردن؛ هەلپێچانی کەسێک بۆ تام‌کردنی شتێک ٢. پێ‌چەشتن؛ کەسێک لە بەرانبەر ئەزموونێکەوە دانان ‹شیرین برای اولین بار مزه‌ی عشق را به او چشاند: شیرین بۆ یەکەم جار تامی ئەوینی پێ‌چێژاند› ***چشانیدن**. هەروەها: **چشاندنی**

■ صفت مفعولی: **چشانده** (چێژێنراو)/ مصدر منفی: **نَچشاندن** (نەچێژاندن)

**چشانیدن** / češānîdan, čašānîdan/ ☜ **چشاندن**

**چشایی** / češāyî, čašāyî/: *اسم.* چێژایی؛ چەشتنی؛ یەک لە پێنج هەستی سەرەکی کە تامی پێ هەست دەکرێ (وەک سوێری، شیرینی، تاڵی، توندی ...) و لە سەر زمان پێ دەزاندرێ: **چشائی**

**چشته** / čašte, češte/: *اسم.* چێژە؛ چەشتە؛ چەشلە؛ چێشتە: ١. بەشێکی زۆر کەم لە چێشت، لە ئەندازەی چەشتن ٢. خۆراکێ کە بە گیانەوەری دەستەمۆی دەدەن.

**چشته‌خور** / čaštexor, češtexor/: *صفت. [مجازی]* چەشتە؛ چەشت؛ چەشتەخۆر؛ چەشتەخۆر؛ چێشتەخۆر؛ چەشتەخۆرە، خووگرتوو بە وەرگرتنی شتێکی کەم لە دیتران ‹نگذار چشته‌خور بشود، دیگر ولت نمی‌کند: مەهێلە

چەشـتە بێـت، ئیتـر لێـت نابێتـەوە›. هـەروەها: **چشتەخورکردن**

**چشم** / čašm/: *قید. [گفتاری]* سـەرچاو؛ بـان چـاو؛ بەسەرچاو؛ بەچاوان؛ وەبانی دیدە؛ سـەرووچەما؛ وشەیەک کە نیشانەی پـەزیرانی فـەرمان یـان تکایە ‹گفتم: «چشم» و فـوری بـه راه افتـادم: گـوتم: «سەرچاو» و دەسبەجێ کەوتمە رێ›.

**چشم** / češm ، ـها؛ ـان/: *اسم.* چـاو؛ چـاڤ؛ چـەو؛ چەم؛ چیم؛ چەعڤ؛ چەش: ۱. دیدە؛ دیە؛ تیـە؛ ئەندامی بینایی لە گیانداران ۲. *[مجازی]* هێـزی تێگەیـشتن و زانـین ‹چـشم دل: چـاوی دڵ› ۳. روانین؛ نوا ‹بـه یـک چـشم دیـدن: بـه چاوێـک دیـتن› ٤. *[گیـاەشناسـی]* چاوکـە؛ قولـکەیەکی چکۆلەی سـەر ریـشە و لاسـکی بـرێ گیـا کـە چەکـەرە دەکـا و دەبێتـە ئەنـدامێکی تـازە ٥. *[کنایی]* چاوەڕوانی؛ هیوا ‹چشم داشتن از کـسی: چاوەڕوانی کـردن لـە کەسـێک› ٦. ئـەوەی وەک چـاوە ‹چـشم گـرداب: چـاوی گێـژاو› ۷. کـون؛ بۆشایی؛ شوێنی خاڵی؛ خاڵیایی ‹هـای دو چـشم: هێی دوو چاو›.

▣ **چشم امید:** *. [مجازی]* چـاوی هیـوا؛ روانـینی هومێدوارانە ‹چشم امیدشان به او بود که آنهـا را از فقر نجات دهـد: چـاوی هیوایـان بـە ئـەو بـوو لـە هەژاری رزگاریان کا›.

**چشم باباغوری** ☜ **باباغوری**

**چشم بادامی:** چاوی بادامی؛ چـاوی کێـشراو و باریک (وەک چاوی خەڵکی رۆژهەڵاتی دوور).

**چـشم بـاطن:** *[مجـازی]* چـاوی دڵ؛ هێـزی هـەڵاوردن و ناسـینی زەیـنی ‹بـرای دیـدن ایـن چیزهـا بایـد چـشم بـاطن داشـته باشـی: بـۆ دیتنی ئـەم شـتانە ئـەبێ چـاوی دڵـت هـەبێ›: **چشم درون/ دل**

**چشم بد:** *. [مجازی]* چاوی خراپ؛ چاوی خـراو؛ چاوی پیس؛ روانینی بەدخوازانە.

**چشم بصیرت:** *[مجازی]* چاوی بینا؛ چاوێ کـە بتوانێ خاس و خراپ لێک هەڵاوێرێ ‹با چشم بصیرت نگاه کن!: بە چاوی بینا بروانە!›.

**چشم بیمار:** *[ادبی]* چاوی خومار؛ چاوی مەست؛ چاوی نیوەبەستراو.

**چـشم تابتـا:** چـاوی خـێڵ؛ چـاوی خوێـل؛ چـاوی چـەپـراس؛ چـاوی چـەوێڵ؛ چـاوی چێڵ؛ چـاوی خـوار و خـێچ؛ چـاوی چـەپ و چـێڵ؛ چـاوی شـاش؛ دوچـاوی وا کـە پێکەوە جووت نەبن.

**چشم تر:** *[کنـایی]* چـاوی فرمێـسکاوی؛ چـاوی تەڕ؛ چاوی بە گریان؛ چاوی پڕ بە فرمێـسک؛ چـاوی ئـاو تێـزاو؛ چـەمی هەرسـین؛ چـاوی گریان.

**چشم خمـار:** چـاوی خومـار؛ چـاوی مەسـت؛ چاوی نیوەخەوتوو.

**چشم درون/ دل** ☜ **چشم باطن**

**چشم زاغ:** چاوی شـین؛ چـاوی کـەوو؛ چـەو کەوو؛ چاوێک کە گلێنەی بە ڕەنگـی شـینە: **چشم کبود**

**چـشم سـوزن:** سـۆ؛ کونـەدەرزی؛ ولـۆچەنی؛ کونی دەرزی کە دەزووی تێوە دەکەن.

**چشم سیاه:** چاوی ڕەش؛ چەمێ سیا؛ سـیاوێ؛ چەوسێ؛ چاوێک کە ڕەنگی گلێنـەی ڕەشـە. هەروەها: **چشم آبی؛ چشم سبز؛ چشم عـسلی؛ چشم میشی**

**چشم شور:** *[مجازی]* چاوی خراو؛ چاوی سۆتک؛ چاوێ کە برێ کەس وا دەزانن زیانی هەیە.

**چشم شهلا:** چاوی کەژاڵ؛ چاوی بـاز؛ چـاوی گەورە و گەش.

**چشم کبود** ☜ **چشم زاغ**

**چشم لوچ** ☜ **لوچ**

▣ **چشم آب نخوردن:** تـێ ڕانـەدیتن؛ چـاو لـێ نەبـڕین؛ چـاوەنۆڕی لـێ نـەبوون؛ چـاوەڕوان نـەبوون؛ هیـوادار نـەبوون ‹چـشم مـن از او آب نمی‌خورد: من تێی ڕانابینم›.

**چشم از جهان (فرو) بستن:** *[ادبی]* چاو لێکنان؛ مالاوایی لە دنیا کردن؛ چاو لە دنیا نووقاندن؛ کۆچی دوایی کردن ‹این دانشمند سال ۱۳۶۹ چشم از جهان فرو بست: ئەم زانایە ساڵی ۱۳۶۹ چاوی لێک نا›.

**چشم آلبالو گیلاس چیدن:** *[مجازی]* چاو ڕێچکە و پێچکەکردن؛ چاو ڕمڵ کردن؛ ورد نەدیتن بە هۆی ماندوویەتی و خەوالوویی یان گریانەوە ‹این آلو نیست، گوجه است مثل این که چشمت آلبالو گیلاس می‌چیند: ئەمە هەڵووژە نیە تەماتەیە وەدیارە چاوت ڕێچکە و پێچکە دەکا›.

**چشم بازار را کور کردن/ درآوردن:** *[مجازی]* بازاڕ ئاوەدان کردنەوە؛ کالای خراپ یان گران کڕین ‹تو هم با این خریدت چشم بازار را کور کردی: تۆش بەم شت کڕینەت بازاڕت ئاوەدان کردەوە›.

**چشم باز کردن:** چاوکردنەوە؛ چەمێ هۆربڕنەی: ۱. *[کنایی]* چاو هەڵێنان؛ سەرەتای چاو پێ‌کەوتن؛ چاو لە ڕووی دنیا هەڵێنان ‹از وقتی چشم باز کردم، آنها در همین کوچه می‌نشستند: لەوەتی چاوم کردووەتەوە، ئەوان لەم کۆڵانەدا بوون› ۲. *[کنایی]* ورد بوونەوە و سەرنجدان ‹باید چشمت را باز کنی ببینی کجا هستی: دەبێ چاو بکەیتەوە بزانی لە کوێی›.

**چشم برگرداندن:** لاکردنەوە؛ چاو لێ‌هەڵگرتن؛ چاو بۆ لایەکی دیکە خستن ‹تا چشم برگرداندم کیفم را دزدیدند: تا لام کردەوە کیفەکەمیان دزی›.

**چشم برنداشتن:** ۱. چاو لێ‌هەڵنەگرتن؛ چاو لێ‌نەبڕین؛ چەم چنە نەویارەی؛ چاودێر بوون؛ لەسەریەک ڕوانین ‹از بچه چشم برنمی‌داشت: چاوی لە منداڵەکەی هەڵنەدەگرت› ۲. *[کنایی]* چاو هەڵنەهاتن؛ چاو لێ‌هەڵنەهاتن؛ چەم نەوینەی؛ چاو لە حاندی شتێ یان کەسێ هەڵنەهاتن ‹چشمش برنمی‌داشت بچەی هوو را ببیند: چاوی هەڵنەدەهات منداڵی هەوەکەی ببینێ›.

**چشم بر هم زدن** ☜ **چشم به هم زدن**

**چشم بر هم نهادن:** *[ادبی]* چاو لێکنان؛ چاو قونجاندن؛ چاو قووجاندن؛ چەم قووجنەی؛ چاو قووچاندن؛ چاو چووقاندن؛ چاو نقاندن؛ چاو نووقاندن؛ پێڵووی چاو بە سەر یەکا نان.

**چشم به جهان گشودن:** *[ادبی]* لە دایک بوون؛ بە دنیا هاتن؛ پەیدا بیەی؛ چاو لە ڕووی دونیا هەڵێنان ‹او در سال ۱۳۳۰ چشم به جهان گشود: لە ساڵی ۱۳۳۰دا لە دایک بوو›.

**چشم به چشم کسی افتادن:** چاوکەوتنە نێو چاوی کەسێکەوە؛ تووشی کەسێ هاتن؛ چاو چەقینە چاو کەسێکا؛ لەگەڵ کەسێکدا ڕووبەڕوو بوون ‹فردا آدم چشمش به چشمشان می‌افتد: شەوسۆ بنیادەم چاوی ئەکەوێتە نێو چاویان›.

**چشم به چیزی انداختن:** چاوێک بۆ شتێ خستن؛ تماشای شتێ‌کردن؛ چەم وسەی پەی چێوێوی (چێویە) ‹یک چشم بینداز کوچه بین چه خبر شده: چاوێک بخە بە کۆڵانەدا بزانە چباسە›.

**چشم به در بودن:** *[کنایی]* چاوەڕێ بوون؛ چەمەڕا بیەی؛ چەوقەڕێ بوون؛ چاوەڕێی هاتنی کەسێک بوون ‹تا صبح چشمش به در بود، ولی پسرش نیامد: تا بەیانی چاوەڕێ بوو، بەلام کوڕەکەی نەهاتەوە›.

**چشم به در ماندن:** *[کنایی]* چاو لە دەرگاوە بوون؛ چاوەنواڕ بوون؛ چاڤنێرمان لە هاتنی کەسێک ‹مدتها چشم به در مانده بودم تا بلکه از تو خبری بشود: زۆر دەمێ بوو چاوم لە دەرگاوە بوو بەلکوو خەبەرێکت لێ بگا›.

**چشم به دست کسی داشتن:** *[کنایی]* چاو لە

دەستی کەسێ بوون؛ دەم بۆ پارووی خەڵک داچەقاندن؛ بە هیوای کەسێ بوون ‹دوست ندارم چشمش به دست این و آن باشد: پێم ناخۆشە چاوی لە دەستی ئەم و ئەو بێت›.

**چشم به دنبال کسی/ چیزی بودن:** چاو لە دووی شتێ/ کەسێکەوە بوون ‹پنجاه سال از عمرش می‌گذشت و هنوز چشمش به دنبال دخترها بود: پەنجا ساڵ لە تەمەنی تێپەڕیبوو هێشتا چاوی لە دووی کچان بوو›.

**چشم بە دو افتادن:** چاوەسپیلکە تووش بوون؛ چاو ڕەشکە و پێشکە کردن؛ چاو ڕمووڵ کردن؛ چاو ڕمێڵەکردن؛ لەرزینی گلێنەی چاو (بەتایبەت لە بەر لاوازی و کزی).

**چشم به دهان کسی دوختن:** ‌.[مجازی] چاو لە دەمی کەسێ بوون؛گوێ ڕایەڵی کەسێک بوون؛ گوێ بۆ قسەی کەسێ شل کردن ‹همه چشم به دهان مدیر دوخته بودند: هەموو چاو لە دەمی بەرپرس بوون›.

**چشم به مال کسی دوختن:**[مجازی] چاو بڕینە ماڵی کەسێ؛ چاو لە ماڵی کەسێ بوون؛ بە تەمای داگیرکردن یان دزینی ماڵی کەسێک بوون ‹ما چشم به مال کسی ندوختەایم: ئێمە چاومان نەبڕیوەتە ماڵی کەس›.

**چشم بە هم زدن:** ١. چاو ترووکاندن؛ چاو ترووکان؛ چەم ترووکنەی؛ چاو پرتووکاندن؛ چاو نقاندن؛ قووجاندن و کردنەوەی چاو ٢.[کنایی] چاو لێک نان؛ (لە مەودای چاو نانە یەکێکدا، ماوەیەکی زۆر کورت) ‹تا چشم بە هم بزنی برمی‌گردم: تا چاو لێک بنی دەگەڕێمەوە› *

**چشم بر هم زدن**

**چشم پوشیدن:**[مجازی] چاوپۆشی کردن؛ چاو لێ‌پۆشان؛ لێ‌بووردن؛ لێ نەگرتن؛ گوێ نەدان؛ بە گرنگ نەزانین ‹این دفعه چشم می‌پوشم ولی تکرار نشود: ئەمجارە چاوپۆشی دەکەم بەڵام دووپاتە نەبێتەوە›.

**چشم پیه گرفتن:**[کنایی] ئاخوڕ بەرز بوون؛ زل بوونەوە؛ دەوڵەمەند بوونەوە ‹حالا دیگر چشمش پیه گرفته است: ئێستە ئیتر ئاخوڕی بەرز بووە›.

**چشم ترسیدن:** ‌.[مجازی] چاو ترسێن بوون؛ چاوترسیان؛ ترسین؛ ترسان؛ ترسیان؛ تەرسەی ‹دیگر چشمم ترسیده بود و از خانه بیرون نمی‌آمدم: ئیتر چاوترسێن ببووم و لە ماڵ دەرنەکەوتم›.

**چشم ــ چشم را ندیدن:**[کنایی] چاوــ چاو نەدیتن؛ ئەنگوستە چاو بوون؛ زۆر تاریک بوون ‹برق رفته بود و چشم‌ـچشم را نمی‌دید: بەرق چووبوو، چاو‌ـچاوی نەدەدیت›.

**چشم خواباندن:**[کنایی] مرخ لێ خۆش کردن؛ چاو داگرتن؛ دەسک وهێشوو کردن؛ خۆ ماتە دان؛ وێ گێرتەیرە؛ مەلازگرتن؛ مەلاس گێرتەی ‹برای دختر همسایه چشم خوابانده بود: مرخی لە کچە دراوسێکەیان خۆش کردووە›.

**چشم خود را بە روی چیزی بستن:**[کنایی] چاوپۆشی کردن لە شتێ؛ چاو لە شتێ قووچاندن؛ چاو نووقاندن لە شتێ؛ بایەخ بە شتێک نەدان؛ لێ‌بووردن؛ گوێ پێ‌نەدان: **چشم روی هم گذاشتن**

**چشم خوردن:**[فرهنگ‌مردم] لە چاو چوون؛ کەوتنە بەر چاو؛ کەفتنە بەر چاوچڵە؛ بوونە چاوەوە؛ لە ئێرەیی چاوپیسان تووشی بەلا هاتن.

**چشم خیره شدن:** ١. شەوارە بوون؛ بە شەوارەکەوتن؛ بە هۆی هۆکارێکەوە (وەک تیشکی هەتاو) بۆ ماوەیەکی کورت بینایی ئاڵۆز بوون ٢.[مجازی] ماق مان/ بوونەوە؛ چاو داچەقیان؛ مات بوون؛ هیدمان؛ لە دیتنی شتێکی سەیر، سەر سووڕمان ‹از آن همه زیبایی چشم‌هایمان خیره

شده بود: لەو هەموو جوانیە ماق ببوینەوە›.

**چشم داشتن:** /مجازی/ چاوەڕوان بوون؛ چاو لێبوون؛ چاوەنۆڕ بوون ‹ما ز یاران چشم یاری داشتیم: چاوەڕوانی یاریدانی یاران بووین›.

**چشم دراندن:** /مجازی/ مۆڕ بردنەوە؛ تیڕ کردنەوە؛ چاو زەق کردن؛ چاو دەرپەڕاندن؛ بە قینەوە بۆ کەسێ ڕوانین.

**چشم درآوردن:** چاو دەرهێنان/ هەڵکڵۆشان: ١. دەرهێنانی گلێنەی چاو ٢. /کنایی/ چاو دەرهاوردن؛ بە ئاکار یان بە قسە و تیتاڵی ئازاردانی دیتران.

**چشم دوختن:** /مجازی/ چاو تێبرین؛ ماق بوون؛ چەو خستن؛ ڕوانین بە وردی ‹چشم دوختە بود بە تلویزیون: چاوی بڕیبووە تەلەڤیزیۆنەوە›.

**چشم دیدن کسی/ چیزی را نداشتن:** /مجازی/ چاو لە کەسێ/ شتێ هەڵنەهاتن؛ لا لە کەسێ/ شتێ نەکردنەوە؛ ڕوو لە کەسێ وەرگەڕاندن؛ زۆر بێزار بوون ‹چشم دیدن مادر شوهرش را نداشت: چاوی لە خەسووی هەڵنەدەهات›.

**چشم را بستن:** چاو بەستن: ١. بان چاو داپۆشین ‹چشم‌هایش را با چشم‌بند بستە بودند: چاویان بە چاوبەند بەستبوو› ٢. چاو لێک نان؛ چاو قووچاندن؛ چاو نووقاندن؛ چاو بە یەکا نان ‹چشمش را بست تا بلکه بخوابد: چاوی لێک نا بەڵکوو بنوێ›.

**چشم را خیره کردن:** ١. چاو خستنە شەوارەوە؛ لە بەر تاوی توند، بینایی تووشی گرفت کردن ٢. ماق کردنەوە؛ چاو مۆڵەق کردن.

**چشم را درویش کردن:** /مجازی/ چاو لێ داخستن؛ چاو پاراستن؛ چاو لە کەسێک (بە تەماییەوە) نەبڕین ‹داداش این خانم شوهر دارد، چشمت را درویش کن!: ئابرا ئەم ژنە مێردی هەیە، چاوتی لێ داخە!›.

**چشم را زدن:** دانە ناو چاودا؛ بوونە هۆی شەوارە داهاتنی چاو ‹آفتاب چشمم را می‌زند: هەتاو دەداتە ناو چاومدا›.

**چشم را مالیدن:** چاو پرواندن؛ چاو ولین؛ چاوگلۆفین؛ چەم پروونەی؛ پێلوی چاو بە ئارامی ماڵین ‹از خواب پریدم و چشمم را مالیدم، دیدم ساعت هشت است: لە خەو داچڵەکام و چاوم پرواند، دیتم کاتژمێر هەشتە›.

**چشم روی هم گذاشتن:** ١. ☜ **چشم خود را به روی چیزی بستن** ٢. ☜ **چشم هم گذاشتن**

**چشم زدن:** /فرهنگ مردم/ کردنە چاوەوە؛ بە چاوەوەکردن؛ چاو لێدان؛ چەم دەی؛ بە ڕوانینێک کە بە گومانی هەندێک زیانبارە، لە کەسێک ڕوانین و بوونە هۆی زیان پێ‌گەیشتنی ‹به گمانم بچه را چشم زده‌اند: بە گومانم منداڵەکەیان کردووەتە چاوەوە›.

**چشم سفید شدن:** کوێرایی داهاتن؛ کوێر بوون؛ بینایی لە دەس‌دان.

**چشم سیاهی رفتن:** بەر چاو تاریک/ ڕەش بوون؛ وەروو چەما سیاو بیەی؛ کز بوون یان لە ناوچوونێکی کاتی بینایی بە هۆی ماندوویی یان هۆکارگەلی‌ترەوە ‹از دیشب چیزی نخوردەام، چشمم دارد سیاهی می‌رود: لە دوێشەوەوە هیچم نەخواردووە، خەریکە بەر چاوم تاریک ئەبێ›.

**چشم کسی چهار تا شدن:** چاوی کەسێک پەڕینە تەوقی سەری؛ زۆر گەورە بوونەوەی گلێنەی چاو بە هۆی ترس یان سەر سوورمانەوە ‹از دیدن آن همه پول چشمش چهار تا شده بود: لە دیتنی ئەو هەموو پووڵە چاوی پەڕیبووە تەوقی سەری›.

**چشم کسی چیزی/ کسی را گرفتن:** ./مجازی/ چاوگرتن؛ چەقینە دڵەوە؛ شتێ یان کەسێک وەبەردڵی کەسێک کەوتن ‹چشمش آن خانه را گرفته بود: ئەو ماڵە چاوی گرتبوو›.

**چشم کسی را دور دیدن:** کەسێک دیار

نەبوون؛ کەڵک وەرگرتن لە نەبوونی کەسێک بۆ کردنی کارێ کە زۆرتر بە پێچەوانەی ویستی ئەو یان بەزیانی بێ. ‹چشم بابا را دور دیدی داری سیگار می‌کشی؟: بابت دیار نیە خەریکی جگەرە دەکێشی؟›.

**چشم کسی روز بد ندیدن:** دوور لەم دەر و بانە بوون؛ دوور بوون لە گیانی کەسێک (ئەم دەستەواژە بە شێوەی «چشمت/ چشمتان روز بد نبیند» بە کار دەچێ، ئەویش لە کاتێکدا کە کەسێ بیهەوێ ڕووداوێکی ناخۆش بگێڕێتەوە) ‹چشمتان روز بد نبیند، چنان سرمایی خوردم که کارم به بیمارستان کشید: دوور لەم دەر و بانە، وا سەرمایەکم خوارد کارم کەوتە بیمارستان›.

**چشم کسی روشن بودن:** */مجازی/* چاوی کەسێ ڕوون بوون: ١. چاو و دڵی کەسێ ڕۆشن بوون؛ چاو کەسێ ڕۆشن بوونەوە؛ شاد بوون ‹چشمتان روشن پسرتان آمد: چاوتان ڕوون کوڕەکەتان هاتەوە› ٢. */تعریض/* کاتێ بەکار دەچێ کە کەسێ بیەوێ نارەزایی و بەرهەڵستی خۆی لە دۆخێکی نالەبار یان چاوەڕوان‌نەکراو دەربڕێ ‹چشممان روشن، پس اینجا هم باز همان آش است و همان کاسه: چاومان ڕوون کەواتە ئێرەش هەر هەمان پیک و هەمان زوڕنایە›.

**چشم گرداندن:** ١. چاوگەڕاندن؛ چاو گێڕان؛ بەرەو هەمووو لا ڕوانین ‹به همه جا چشم گرداندم، ولی او را ندیدم: بە هەمووو لایەکدا چاوم گەڕاند، بەلام نەمدیت› ٢. هەڵگەڕانەوە؛ لا کردنەوە.

**چشم گرم شدن:** */مجازی/* چاو گەرم داهاتن؛ خەو لێ کەوتن ‹تازه چشمم گرم شده بود که در زدند: تازە چاوم گەرم داهاتبوو، درگایان کوتا›.

**چشم و ابرو آمدن:** */مجازی/* چاو هەڵتەکاندن؛ بڕۆ هەڵتەکانن؛ بە چاو و بڕۆ بۆ کەسێ هێماکردن ‹داشت برای پسر همسایه چشم و ابرو می آمد: خەریک چاوی لە کوڕە دراوسێکەیان هەڵدەتەکاند›.

**چشم و دل دویدن:** */مجازی/* دڵ بۆ کەسێ/ شتێ کورکاندن؛ زۆر تامەزرۆی شتێ بوون ‹هنوز چشم و دلش دنبال زنها می‌دوید: هێشتا دڵی بۆ ئافرەتان ئەیکورکاند›.

**چشم و دل کسی پاک بودن:** */مجازی/* دەست و چاوی کەسێک پاک بوون؛ دەست و داوێنی کەسێک پاک بوون ‹خیلی چشم و دل پاک است: زۆر دەست وچاو پاکە›.

**چشم و دل کسی روشن شدن:** */مجازی/* چاو و دڵی کەسێ ڕۆشن بوونەوە؛ زۆر شاد و دڵخۆش بوونی کەسێک. هەروەها: **چشم و دل کسی را روشن‌کردن**

**چشم و گوش کسی را باز کردن:** */مجازی/* کەسێک تێگەیاندن؛ وریا کردنەوەی کەسێ؛ زانیاری و ئاگاداری پێویست بە کەسێک دان.

**چشم هم گذاشتن:** */گفتاری/* ١. چاو لێکنان؛ چاو نانە یەک؛ چەم نیە پێوەنەی ‹دیشب چشم هم نگذاشتم: دوێشەو چاوم لێک‌نەنا› ٢. */مجازی/* گوێ نەدان؛ چاو لێ‌داپۆشین؛ بەر چاو نەگرتن ‹عیب ندارد، چشمت را هم بگذار!: قەی ناکا، گوێ مەدەیە!› ❋ **چشم روی هم گذاشتن**

**از چشم افتادن:** */مجازی/* لە بەر چاو کەوتن؛ هۆرکەوتەی؛ لە بەر بێزان ‹بعد از آن دیگر از چشم همه افتاد: دوای ئەوە ئیتر لە بەر چاو هەموان کەوت›.

**از چشم کسی دیدن:** */مجازی/* لە کەسێک زانین؛ کەسێک بە هۆکار زانین ‹همه گرفتاری آزاد را از چشم او می‌دیدند: هەمووو گیر و گرفتی ئازادیان لەو / لە ئەو دەزانی›.

**از زیر چشم نگاه کردن:** */مجازی/* لە ژێر چاوەوە ڕوانین؛ بە دزیەوە ڕوانین؛ چێروو چەمانە دیەی ‹از زیر چشم نگاه کردم و دیدم خود اوست: لە ژێر چاوەوە ڕوانیم و دیتم خۆیەسی›.

**بالای چشم کسی ابرو بودن:** */مجازی/* لە گوڵ

کالتر پێ وتن؛ ڕخنه گرتن (کاتێ دەگوترێ کە نەکرێ هیچ قسەی ڕاستێکیش لەبارەی کەسێکەوە بکرێ) ‹به او دیگر نمی‌شد گفت بالای چشمت ابروست: ئیدی نەدەکرا لە گوڵ کالتری پێ بێژی›.

**به چشم آمدن:** *[مجازی]* ۱. بەر چاوگرتن؛ سەرنج بەرەو لای خۆ بردن ‹این پولها به چشم او نمی‌آمد و برایش ارزشی نداشت: پارەی وا بەرچاوی نەدەگرت و بۆی بایەخێکی نەبوو› ۲. هاتنە بەر چاو؛ کەوتنە بەرچاو؛ بینران؛ بە بیرگەیشتن ‹تنها چیزی که در آن به چشم نمی‌آمد، تملق بود: هیچ زمانلووسی تێیدا نەدەهاتە بەر چاو›.

**به چشم چیزی نگاه کردن:** *[مجازی]* بە چاوی کەسێکەوە لە/ بۆ کەسێ/ شتێ ڕوانین؛ بە چاوی شتێکەوە تماشای کەسێ کردن ‹به چشم خواهری نگاه می‌کرد: بە چاوی خوشکەوە لێی دەڕوانی›. هەروەها: **به چشم چیزی آن را دیدن**

**به چشم خریدار نگاه کردن:** *[مجازی]* بە چاوی مشتەری لێڕوانین: ۱. خوازیاری کەسێ یان شتێک بوون ‹خیلی به چشم خریدار به دختره نگاه می‌کرد: زۆر بە چاوی مشتریەوە لەو کچەی دەڕوانی› ۲. بە حەز و وردبینیەوە تماشا کردن.

**به چشم خوردن:** *[کنایی]* هاتنە بەر چاو؛ دیار بوون؛ دەرکەوتن؛ بەدی کران؛ پیویەی ‹در دوردست نوری به چشمم خورد: لە دوورەوە ڕۆشناییەک هاتە بەرچاوم›.

**به چشم دیدن:** بە چاو خۆ دیتن؛ بە هەر دوو چاو دیتن؛ بە چەم دیەی ‹این را دیگر به چشم دیدم: ئەمەم ئیتر بە چاوی خۆم دی›.

**به یک چشم برهم زدن** ☜ **یک**[۲]

**به یک چشم نگاه کردن** ☜ **یک**[۲]

**پشت چشم نازک کردن:** *[مجازی]* نازونووز کردن؛ فیز/ فیس کردن؛ گریشمە هاتن ‹آن دختر داشت برایمان پشت چشم نازک می‌کرد: ئەو کچە خەریکبوو نازونووزی ئەکرد بۆمان›.

**تا چشم کار کردن:** *[کنایی]* تا چاو/ هەتەر/ کار/ حوکم/ بڕ کردن؛ تا چەم هانا دەی؛ تا شوێنێک کە چاو دەتوانێ ببینێ ‹تا چشم کار می‌کرد باغ و بستان بود: تا چاو کاری دەکرد باخ و بێسان بوو›.

**تا یک چشم به هم زدن:** *[مجازی]* لە چاو ترووکانێکدا؛ لە چاو پرووکانێکدا؛ زۆر خێرا و زوو ‹تا یک چشم به هم زدن می‌روم و برمی‌گردم: لە چاو تروکاندێکدا دەڕۆم و دێمەوە›.

**روی چشم کسی جا داشتن:** *[مجازی]* لە سەر چاوانی کەسێک بوون؛ زۆر لە لای کەسێک خۆشەویست بوون ‹شما روی چشم بنده جا دارید: ئێوە لە سەرچاوی منن›.

**چشم‌انتظار** / češmentezār/: [فارسی/ عربی] *صفت. [مجازی]* چاوەڕوان؛ چاوەڕێ؛ چەوەڕی؛ چاوەنۆڕ؛ چەهڤنێر؛ چەمەڕا؛ چاو لە دوا؛ چاولەدوو؛ چەمەو دما؛ بە تاسە و تەما بۆ ... ‹از صبح چشم‌انتظار شما بودم: لە بەیانیەوە چاوەڕوانی ئێوە بووم›.

**چشم‌انتظاری** / češmentezārî/: [فارسی/ عربی] *اسم. [گفتاری]* چاوەڕوانی؛ چاوەڕێیی؛ چاوەنواڕی؛ چەمەڕایی؛ چەمەو دمایی؛ چاولەدوویی؛ چەهڤنێری ‹چشم‌انتظاری خیلی سخت است: چاوەڕوانی زۆر دژوارە›.

**چشم‌انداز** / češmandāz، ـها/: *اسم. [مجازی]* بەرجەوەن؛ بەرژەوەند؛ دیمەن؛ دیامان؛ بەرچاوگە؛ بەرچاو: ۱. خویانەک؛ چاوەناز؛ بەرچاڤک؛ وەرەچەم؛ ئەوی کە لە پێش چاواندایە ‹پنجره‌های اتاق خواب مُشرف به باغی بود و چشم‌انداز قشنگی داشت: دەلاقەکانی ژووری خەو دەیانڕوانیە سەر باخێکدا و بەرجەوەنێکی جوانی هەبوو› ۲. *[مجازی]* چاوەنواڕی؛ هیوای بە ئاکام

گەیشتن یان پێشڕەوت‌کردن لە کارێکدا ‹چشم‌انداز این کار خیلی خوب است: بەرچاوگەی ئەم کارە زۆر باشە›.

**چشم‌براه** / češmberāh‌/: *صفت. [کنایی]* چاوەڕێ؛ چەوەڕێ؛ چاونهێر؛ چاوەنۆڕ؛ چاوڕێگە؛ چاوەنواڕ؛ چەمەڕا؛ چاڤ‌نهێر؛ لهێڤ ‹مدت زیادی چشم‌براه بودم تا بیایی: ماوەیەکی زۆر چاوەڕێ بووم تا بیتەوە›.

**چشم‌براهی** / češmberāhî‌/: *اسم. [گفتاری]* چاوەڕوانی؛ چاوەڕێیی؛ چاوەنواڕی؛ چاوەنۆڕی؛ چەمەڕایی؛ چاونهێری؛ دۆخ یا حاڵەتی چاوەڕێ بوونی شتێ یان کەسێک ‹پس از دو سال چشم‌براهی توانست پسرش را ببیند: لە دوای دوو ساڵ چاوەڕوانی توانی کوڕەکەی ببینێ›.

**چشم‌بسته** / češmbaste‌/: *قید.* چاوبەسراو؛ بە چاوی بەسراو؛ بە چاو قووجیاگ؛ چاڤ‌گرێدای؛ بە بێ ڕوانین ‹من این راه را چشم‌بسته می‌روم: من ئەم ڕێگەیە چاوبەسراو دەڕۆم›.

▣ **چشم‌بسته غیب گفتن:** *[تعریض]* وتنەوەی شتێکی ڕوون و ئاشکرا.

**چشم‌بند** / češmband ، ـها‌/: *اسم.* چاوبەن؛ چاوبەند؛ چاوبەست؛ کەرەستەیەک بۆ بەستنی چاو و بەرگری لە دیتن ‹او را سوار ماشین کردند و چشم‌بند به چشمش زدند: سواری ماشینیان کرد و چاوبەنیان کردە چاوی›.

**چشم‌بندی** / češmbandî ، ـها‌/: *اسم.* چاووڕاو؛ چاوبەستی؛ چاوبەندی؛ هەر یەکە لەو کارە سەیر و سەمەرانە کە بە تەڕدەستی و کەلک وەرگرتن لە هەڵەی چاو و خەڵەتاندنی هەستی بینەر دەکرێن.

**چشم‌پرکن** / češmporkon‌/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* بەرچاو؛ بەرچاوگر ‹یک چیز چشم‌پرکن می‌خریدی، که بشود به کسی داد: شتێکی بەرچاوت دەکڕی، کە بکرایە بە کەسێکمان بدایەت›.

**چشم‌پزشک** / češmpezešk, -pezešg ، ـها؛ ـان‌/: *اسم.* چاوپزیشک؛ پزیشکی چاو؛ دوکتوری چاڤ.

**چشم‌پزشکی** / češmpezeškî, -pezešgî‌/: *اسم.* چاوپزیشکی؛ لقێ لە زانستی پزیشکی پێوەندیدار بە خوێندنەوەی پێکهاتە، کار، نەخۆشیگەل و دەرمانی چاو.

**چشم‌پوشی** / češmpûšî‌/: *اسم. [مجازی]* چاوپۆشی؛ گوزەشت؛ چاوپۆشین؛ چاڤ‌گری؛ کار یان ڕەوتی بووردن و کەلک وەرنەگرتن لە مافی خۆ بۆ تۆڵەکردنەوە ‹این دفعه از تنبیهت چشم‌پوشی می‌کنم، ولی دیگر تکرار نشود: ئەم جارە لە تەمێ‌کردنت چاوپۆشی دەکەم، بەڵام ئیدی دووپات نەبێتەوە›.

**چشم‌تنگ** / češmtang‌/ ☜ **تنگ‌چشم**

**چشم‌تنگی** / češmtangî‌/ ☜ **تنگ‌چشمی**

**چشم‌چپ** / češmčap ، ـها‌/: *صفت.* خێل؛ خوێل؛ فیچ؛ خوول؛ خێل؛ خل؛ چاڤویر؛ چاوگێڕ؛ چاولار؛ چاوچەپە؛ چاوخوێل؛ چاوچەوێل؛ چاو چەپراس؛ چاوچێل؛ چاوشاش؛ چەملار.

**چشم‌چران** / češmčarān ، ـها‌/: *صفت. [مجازی]* چاولەوەڕێن؛ چاوچلێس؛ چاوحیز؛ چاوباشقال؛ چاوباز؛ چاوچڕێن؛ چاڤ‌لدەر؛ تۆلاز؛ نەزەرباز؛ قۆق؛ خاوەن واز یان خووی چاوچڕێنی.

**چشم‌چرانی** / češmčarānî ، ـها‌/: *اسم. [مجازی]* چاولەوەڕێنی؛ نەزەربازی؛ چاوچڕێنی؛ چاوچەرێنی؛ چاوحیزی؛ تۆلازی: ١. مەیل یا خووی تەماشا کردنی لەش، بەتایبەت ئەندامگەلی جنسی لفی خۆ ٢. ڕوانین لە لفی خۆ بۆ چێژەی جنسی.

**چشمخانه** / češmxāne ، ـها‌/: *اسم.* قووڵکەی چاو؛ قوولایی چاو؛ چاوگا.

**چشمداشت** / češmdāšt‌/: *اسم. [مجازی]* چاوەنواڕی؛ چاوەنۆڕی؛ چاولەدوویی؛ چاولەدوایی؛ هیواداری؛ هیوای بە جێ‌هێنانی کارێک لە لایەن کەسێک یان بە دەست هێنانی بەهرەیەک لە شتێ، لە

داهـاتوودا ‹مـن از شـما چـشمداشتی نـدارم: مـن چاوەنوارییەکم لە ئێوە نیە›.

**چشم‌درد** / češmdard/ ☜ **ـ درد**[۲]

**چـــشم‌دریـــدگی** / češmdarîdegî/: *اســم. [مجـازی، گفتـاری]* بـێ‌شـەرمی؛ بـێ‌حـەیایی؛ بـێ‌چـاوەڕۆیی؛ بـێ‌چـاوری؛ چاوقـایمی؛ ڕووداری؛ گەڤـــەندەیی؛ قرشماڵـــــی؛ شـەرمتکـاوی؛ ڕوودامـالاوی؛ ڕووهەڵـمالاوی؛ دەلوقـــەلی؛ بـێ‌ئـاوڕوویی؛ گۆسـارتمەیی؛ گوسـارغمەیی؛ چەقەسـۆیی؛ چەقاوەسـۆیی؛ چارداوەڕوویی؛ چەتاوەڕوویی.

**چشم‌دریده** / češmdarîde ، ـها/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* چاوقایم؛ بێ‌شـەرم؛ بێ‌چـاوڕۆ؛ بـەڕوو؛ گەڤـەندە؛ ڕووقـایم؛ ڕووهەڵـمالاو ‹خیلـی پـررو و چشم‌دریده شده بود: زۆر ڕوودار و بێ‌شەرم ببوو›.

**چـــشمرس** / češmras/: *اسـم. [مجـازی]* هەتـەر؛ چاوبڕ؛ چاودی؛ مەودایەک کە چاو هانای بکا.

**چشم‌روشـنی** / češmrowšanî, -ro:šanî ، ـها/: *اسم. [کنایی]* چاوڕۆشنی؛ چاورووونی؛ دیاریـێ کـە دۆسـتان یـان نزیکـان، بـە نیـشانەی شـادی دەربڕین لە ڕووداوێک بۆ کەسێکی دێنن.

**چـــشم‌زخـــم** / češmzaxm/: *اسـم.* چـاوەزار؛ چاوێنی؛ چەمەزەخمـە؛ چاوچڵە؛ زیانێـک کـە وا دەزانــن بـەهۆی چـاودانی دیترانـەوە پـێش هاتووە.

⊡ **چشم‌زخم دیدن**: بە چـاوەوە بـوون؛ بـەرچاو/ چاوچڵە کەفتن؛ چاوێنی بوون؛ چاو خـواردن؛ کریانە چاوەوە. هەروەها: **چشم‌زخم رسـیدن؛ چشم‌زخم وارد شدن**

**چشم‌سـفید** / češmsefîd, -sifîd ، ـها/: *صفت [مجازی. گفتاری]* بـێ‌حـەیا؛ بـێ‌شـەرم؛ چاوقـایم؛ ڕووقـایم؛ ڕووداماڵـیاگ؛ قـەرەچناخ؛ قـەرەچی؛ ڕیلاس؛ بێ‌چاو ڕوو؛ دوقدۆقە.

**چـــشم‌سـفیدی** / češmsefîdî, -sifîdî/: *اسـم. [گفتـاری]* ڕووداری؛ بـێ‌حـەیایی؛ بـێ‌شـەرمی؛ چاوقایمی؛ ڕووقـایمی؛ ڕووداماڵـیاگی؛ ڕیلاسـی؛ دوقدۆقەیی.

**چشم‌شور** / češmšûr/ ☜ **چشم‌شوی**

**چـشم‌شـوی** / češmšûy ، ـها/: *اسم.* چاوشـۆر: ۱. شووشەی تایبەتی چاو شوتن ۲. تراوێک کـە چاوی پێ‌دەشۆرن ✻ **چشم‌شور** *[گفتاری]*

**چـشم‌غـره** / češmqorre ، ـها/: *اسم. [مجازی، گفتاری]* مۆڕ؛ چاوبزی؛ چاوپێلی؛ چەوپێڵە؛ تیڕی؛ تێڕی؛ ڕوانینی بە تووڕەییەوە، بۆ هەڕەشـە یـان هۆشدانەوە.

⊡ **چشم‌غره رفتن**: *[مجازی، گفتاری]* مۆڕ بردنـەوە؛ چـاو دەرپەڕانـدن؛ تێـڕی کـەردەیوە؛ چـەو پێڵەکردن؛ بە هەڕەشە و تووڕەییـەوە ڕوانـین ‹تا چشم غره رفت، بچـه سـاکت شد: هـەر مـۆڕی بردەوە منداڵەکە بێدەنگ بوو›.

**چشمک** / češmak ، ـها/: *اسم.* ۱. چـاوداگری؛ چاوقرتکـێ؛ چاوەقرتـێ؛ چاوبـرکێ؛ قومچـەو؛ چۆنیەتی کردنەوە و دانەیەکی چاو بـە گـورجی ‹سـرش را برگردانـد و بـه شـوهرش چـشمک زد: لای کـردەوە و چـاوی لـە شـووەکەی داگـرت› ۲. ترووسکە؛ ترووکە؛ زریوە؛ چۆنیەتی هەڵبوون و دایـسانی شـتێکی ڕوونـاک لـە سـەر یـەک ‹چـشمک سـتارەهـا در آسـمان شـب: ترووسـکەی ئەستێرەکان بە ئاسمانەوە›.

**چـــشمک‌زن** / češmakzan/: *صـفت.* بـە تروکـــەترووک: ۱. قومچەوخـــەر؛ بـــە تایبەتمەنـدی چـاو قرتانـدنی پەیتاـ پـەیتا ۲. ترووکـــەدەر؛ ترووســـکەدەر؛ بـــە سـەرچاوکەیەکی ڕوونـاکی کـە پـەیتا ــ پـەیتا هەڵـبێ و دایـسێ یـان دەرکـەوێ و ون بێتەوە ‹چراغ چشمک‌زن: چرای ترووکەدەر›.

**چـشمگیر** / češmgîr/: *صفت. [مجازی]* گـرنووز؛ بەرچاو؛ بەرچاوگر؛ گرنگ و بە بایـەخ (لـە بـاری چەندیەتی و چۆنیەتیەوە).

**چشم و چار** / češm-o-čār/: *اسم. [گفتاری]* چڕ و

چاو؛ چرچەو؛ ئەندامی دیتن ‹می‌زنی چشم‌وچارش را کور می‌کنی: لێی دەدەی چروچاوی کوێر دەکەی›.

**چشم و چراغ** / češm-o-čerāq /: *اسم. [مجازی]* دلخۆشی؛ چاو روونکەرەوە؛ هۆی گەرمی و رووناکی ‹او چشم و چراغ خانواده بود: ئەو دلخۆشی بنەماڵە بوو›.

**چشم و دل‌پاک** / češm-o-delpāk /: *صفت. [مجازی، گفتاری]* دەست و چاو پاک؛ دەس و دڵ پاک؛ ئاز.

**چشم و دل‌سیر** / češm-o-delsîr /: *صفت. [مجازی، گفتاری]* بەرچاو پڕ؛ بەرچاو تێر؛ تێر؛ دوور لە چاوچنۆکی ‹آدم چشم و دل‌سیر برای پول سر خم نمی‌کند: مرۆی بەرچاوتێر بۆ پارە سەردانانەوێنێ›.

**چشم و گوش بسته** / češm-o-gûšbaste /: *صفت. [کنایی]* چاونەکراوە؛ فەقیر؛ بەستەزمان؛ نائاگا و بێ‌ئەزموون ‹دختر چشم و گوش‌بسته را می‌فرستی به یک شهر غریب؟: کچی چاو نەکراوە دەنێریتە شارێکی غەریب؟›.

**چشم و همچشمی** / češm-o-hamčešmî ، ـها /: *اسم. [مجازی، گفتاری]* چاولێکەری؛ چاولێگەری؛ چاولیەری؛ هاڤرک.

**چشمه** / češme ، ـها /: *اسم.* ١. کانی؛ کانیاو؛ کێنی؛ کیەنی؛ کەهنی؛ کەونی؛ هینی؛ هەنی؛ هانە؛ هێن؛ خانی؛ خنی؛ چاوک؛ چەشمە؛ تیەنگ؛ چاوکەی ئاوی سروشتی لە سەرزەوین کە بە هۆی دەردانی ئاوگەلی ژێر زەوینەوە بە دی دێت ‹رفته بود از چشمه آب بیاورد: رۆیشتبوو لە کانی ئاو بێنێ› ٢. *[مجازی]* سەرچاوە؛ هانەچەمە؛ شوێنی سەرهەڵدان، ڕەوان بوون یان بڵاو بوونەوەی شتێ ‹چشمه‌ی دانش: سەرچاوەی زانست› ٣. چاوە؛ دەرگانەی پرد ‹یکی از چشمه‌های پل را آت‌وآشغال گرفته بود: یەک لە چاوەکانی پردەکە زبڵ‌وزاڵ گرتبووی› ٤. وێنە؛ نموونە؛ زانیاری لە یاری نومایشی، بەتایبەت لە تەردەستیدا ‹چند چشمه از کارهایش را نمایش داد: چەند وێنە لە کارەکانی نیشاندا› ٥. چاوە؛ چاو؛ هەر یەکە لە کونگەلی تۆڕ یان کەرەستەی کون‌ـکون.

◙ **چشمه‌ی آب‌گرم:** گرماڤ؛ گراو؛ گەرمکاو؛ گەرمکە؛ گەرمووک؛ گەرمک؛ گەرمەڵە؛ چاوکەی ئاوی گەرم؛ کانیەک کە ئاوی گەرم بە تینی زۆرتر لە $20^{\circ}C$ (و جارجارەش ئاوە کوڵ)ی لێ دێتە دەرەوە. هەروەها: **چشمه‌ی آب معدنی**

**چشمه‌ـچشمه:** چاوکەـچاوکە؛ چاوەـچاوە؛ کونا‌ـکونا؛کون‌ـکون؛ وڵەـ وڵە؛ بە کون یان بۆشایی زۆرەوە.

**چشمه‌سار** / češmesār ، ـها؛ ـان /: *اسم.* ١. زۆنج؛ چاوکەسار؛ شوێنێ کە کانی زۆری تێدایە ٢. سەرچاوکە؛ سەرچاوە؛ سەرچەمە؛ هانەچەمە؛ شوێنی دەرکەوتنی ئاوی کانی لە زەوی.

**چشمی** [1] / češmî ، ـها /: *اسم.* چاونە: ١. نیسکۆکێکی چکۆلە لە دەرگادا بۆ لێڕوانین ‹از چشمی نگاه کرد، کودکی پشت در بود: لە چاونەوە ڕوانی، منداڵێک لەو دیوی دەرکەوە بوو› ٢. جێ چاو دانان و ڕوانین لە هەر ئامرازێکی وەک: میکروسکۆپ، تیلسکۆپ و...

**چشمی** [2]: *صفت.* چاوی؛ پێوەندیدار بە چاوەوە ‹قطره‌ی چشمی: قەترەی چاوی›.

**چشیدن** / češîdan,čašîdan /: *مصدر. متعدی.* // **چشیدی:** چەشتت؛ **می‌چشی:** دەچێژی؛ **بچش:** بچێژە// چەشتن؛ چێژتن؛ چەشتەی: ١. تام‌کردن؛ چێژەکردن؛ مێلاک‌کردن؛ شتێ بۆ ناسینی تامی نانە دەم ‹بچش ببین نمکش کافی است: بیچێژە بزانە خوێی بەسە› ٢. چەشکەکردن؛ چەشەکردن؛ بە تامێک زانین ‹چشیدم شور بود: چەشتم سوێر بوو› ٣. *[مجازی]* هێچاندن؛ ئازمان؛ ئەزموون؛ تاقی‌کردنەوە ‹مزه‌ی زندگی را چشیدن: چێژەی

ژیان چەشتن›. هەروەها: **چشیدنی**

■ صفت فاعلی: **چشنده** (چێـژەر)/ صـفت مفعـولی: **چشیده** (چێژراو)/ مصدر منفی: **نچشیدن** (نەچێژان)

**چطور** [1] / četowr, četo:r/: [فارسی/ عربی] *صفت*. چۆن؛ چوون؛ چوو؛ چلۆن؛ چەین ‹کـارش چطـور بود؟: کاری چۆن بوو؟›.

**چطور** [2]: *قید. [گفتاری]* چۆن؛ چـەنی: ١. چـەین؛ چاوان؛ چلـۆن؛ چـوو؛ چـاوا؛ کـوو؛ چۆنـاوچۆن؛ ئیکوو؛ ئیکوویی؛ چاڤا؛ کسا؛ کسان؛ کتـۆ؛ شـتۆ؛ شـتەو ‹چگونـه کـار مـی‌کنـد؟: چـۆن کـار دەکـا؟› ٢. بۆچی؛ بۆ؛ بۆچە؛ چۆن‌بوو؛ ئـەڕا؛ چـی؛ پـەی چێشی؛ پەی چێ؛ پەرێ چێش؛ بـە چ هۆیـەک ‹چگونه امروز سر کار نرفتی؟: بۆچی ئەمـڕۆ نەچوویتـە سەر کار؟›.

**چغاله** / čaqāle، ـها/: *اسم.* چواله؛ چەقاله؛ تەقاله؛ بەری نەگەییوی شێلانە و بادەم و... : **چاغاله**

▣ **چغالـه بـادام**: بایـەو؛ بایـەف؛ حـاجی بـایف؛ حـاجی بـایف؛ حـاجی بایـەف؛ چۆلـە بـادام؛ فەریکە بادام؛ چەقالە بـادام؛ بادامچـە؛ بـەری کاڵ و نەگەییوی بادام.

**چغر** / čeqer, čaqar/ ☜ **چغِرمه**

**چغرمگی** / čeqermegî/: *اسم.* ١. جیری؛ جێڕی؛ چێڕی؛ چەقی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی چیـر بـوون ٢. وزری؛ ئاژی؛ قەتماغـەی زبـر و زوور کـە بـە هۆی کاری زۆر لە سەر پێست بەدی دێ.

**چغرمـه** / čeqerme/: *صفت.* جیـڕ؛ جێـڕ؛ چێـڕ؛ سفت و پتەو لـە بەرانبـەر کێـشان و پچڕانـەوە: **چغر**

**چغلـی** / čoqolî، ـها/: *اسم. [گفتـاری]* فتنـەیی؛ دۆقلمـــەری؛ هـــەواڵ بـــردنی کـــاری خراپـــی چکۆلـەتر یـــان ژێردەســـت بـــۆ لای کەســـی گـەورەتر یـان پلـە سـەرتر ‹بچـەهـا از آزاد پـیش پـدرش چغلـی کردنـد و گفتنـد او شیـشه را شکـسته: منداڵـەکان فتنـەیی ئازادیـان لای بابیـەوە کـرد و گوتیان ئەو شیشەکەی شکاندووە›.

▣ **چغلی کردن**: فتنـەیی‌کـردن؛ لەمـەڕ کـاری هەڵەی کەسێکی چکۆلەترەوە بە گەورەیـەک خەبەردان.

**چغنـدر** / čoqondar، ـها/: *اسم.* چەوەنـدەر؛ چۆنەر؛ چۆنـەری؛ چەوەنـەر؛ چەنـەوەر؛ سـلک؛ سلکێ سۆر؛ شەواندەر: ١. پنچکەگیای گەڵاپانی ساقەتە ڕاستی بن‌ئەستوورە کـە چـەن جـۆری هەیە ٢. بنی ئەو گیایە کە گۆشتنە و دەخورێ.

▣ **چغندر قند**: چەوەندەری قەن؛ چۆنـەر قـەن؛ جۆرێک چەوەندەر کە زۆر شیرینە و شەکری لێ دەگرن.

**چغندر وحشی**: چەوەندەری کێـوی؛ چۆنـەری کێوی؛ جۆرێـک چەوەنـدەر کـە بـۆ دەرمـان ئەشێ.

**چفـت** [1] / čeft، ـها/: *اسم.* چەفتـەڕێز؛ چـەفت؛ سـورگی؛ کولـۆم؛ شـەوژەن؛ ڕادان؛ شـەوبەن؛ ئاڵـقەڕێزی دەرگـا؛ زنجیرۆکـەی دەرکـە یـان دەلاقە داخستن.

▣ **چفت چیزی را انداختن**: چەفتـەڕێزی شـتێ بەسـتن؛ ئاڵـقەڕێزی شـتێ داخـستن؛ ڕادانی شتێ داخستن؛ قەلقوولەکردن؛ شەوژەن‌کردن (زۆرتر بۆ دەرک و دەروازە دەگوترێ).

**چفت کـردن**: چەفتـەڕێزکردن؛ بـە ئاڵـقەڕێز بەستن؛ چەفت کردن. هەروەها: **چفت شدن**

**چفت** [2]: *صفت.* کپ؛ مووبڕ؛ توند و بە بـێ‌بـەین لەگـەڵ شـتێکی‌تـردا ‹در را خـوب چفـت کـن!: دەرکەکە جوان کپ بکە!›.

**چفت‌وبست** / čeft-o-bast، ـها/: *اسم.* قوڵف و قەڕازە؛ چـەفت و بـەس؛ ئـامرازی بەسـتنەوە وەک چەفت و قڵف و...

▣ **چفت‌وبست نداشتن**: ئاڵقەوگاڵە نـەبوون؛ بـێ ئاڵقە و گاڵـە بـوون ‹درهـا چفـت‌وبـست درسـتی ندارند، با یـک هـل دادن بـاز مـی‌شـوند: دەرگاکـان ئاڵقەوگاڵەیەکی باشیان نیە، پاڵێکیان پێوە نـەی، دەکرێنەوە›.

**چفتـه** / čefte, čafte ، ـهـا/:اسم. ۱. کەڵـەژ؛ چەڵەمە؛ کۆڵـەکە؛ قایمـە؛ داری دوولـەپان کـە دەیدەن بە پاڵی شتێکەوە ‹چفتـەی مـو: کەڵـەژی مێو› ۲. قووڵگەی پشت ئانیشک و پشت ئەژنۆ.

**چفتـەبنـدی** / čeftebandî, čafte- ، ـهـا/:اسم. کەڵـەژبەندی؛ کـار و ڕەوتی دانـانی گیاگـەلی هەڵپێچەر بە سەر کەڵەژدا.

**چقدر**[1] / čeqadr/: [فارسی/ عربی] صفت. چەنـد؛ چەندە؛ چەنێ؛ چەندێک؛ چەنێک؛ چننە؛ چندە؛ چن؛ چقاس؛ چەن؛ چقـا؛ بـە چ هەنـدێ ‹چقـدر بدهی داری؟: چەندت قەرز هەیە؟›.

**چقدر**[2]: قید. چەند؛ چەنـدە؛ چـەنێ؛ چـن؛ فـرە؛ زۆر؛ هێجگار؛ یەکجار؛ چکاس؛ چەنیگ؛ گەلەک ‹چقدر خوب می‌خواند!؛ چقـدر خوابیـدم!: چەنـدە بـاش دەخوێنێ!؛ چەند خەوتم!›.

**چـک** / čak ، ـهـا/:اسم. [گفتـاری] زیلـە؛ زللە؛ زللەه ؛ کەشیە؛ شەقەزیلە؛ شەقەزلە؛ شـەپلاخە؛ چەپلاخە. هەروەها: **چک خوردن؛ چک زدن**

**چـک** / ček/: [انگلیسـی] اسـم. ۱. ـهـا/ چـەک؛ پـسوولە؛ پەڕەیـەکی چـاپی کـە بـە خـاوەن حیـسابی بـانکی دەدرێ تـا بتوانـێ بـۆ خـۆی یـان کەسـێکی‌تـر لـە بانـک پـارە دەربێنـێ ۲. کـار یـان ڕەوتی چـاو خـشاندن و پێـدا هاتنـەوە بـۆ دڵـنیایی ‹همـه را چـک کـردم: بـە گـشتیدا هاتنـەوە› ۳. ـهـا/ چێـک؛ هـەر یەکـە لـە خەڵـکانی سـەر بـە وڵاتی چێـک یـان زارۆکانیـان ٤. چێکـی؛ چێـک؛ لـە زبانگـەلی ئیـسلاوی ڕۆژئـاوایی بـاو لـە وڵاتی چێکـدا: **چکی**

▣ **چک بانکی:** چەکی بانکی؛ چەکی چوانگەیی.

**چک بی‌محل:** چـەکی لـەگۆترە؛ چـەکێ کـە خاوەنەکەی ئەوەندە لێ نووسراوە پـارەی لـە بانکدا نەبێ.

**چک تضمین شده:** چەکی دەستەبەر؛ چـەکێ کە لە لایەن بانکێکەوە بلاو بووەتەوە و کردنـە پـارەی لـە هـەموو لقـەکانی ئـەو بانکـەدا دەستەبەر بووە.

**چک سفید مهر / سفید امضا:** چـەکی سـپی؛ چەکی واژۆ یان مۆرکراوی تێدا نەنووسراو، کە وەرگری چەک دەتوانێ پارەی دڵخوازی تێدا بنووسێ.

**چک مسافرتی:** ڕێبوار چەک؛ چـەکێ کـە لـە لایەن بانکەوە بە ڕێبواران دەفرۆشـرێت و لـە هەموو لقەکانی ئەو بانکەدا بڕی هەیە: **تـراول چک؛ تراولر چک**

▣ **چک کردن:** پێدا هاتنەوە.

**چک کشیدن:** چەک کێشان؛ نووسینی چەک بۆ وەرگرتنی پارە لە بانکدا ‹چک کشیدم رفتم از بانک پول گرفتم: چەکم کیشا و چوومە بانک پارەم وەرگرت›.

**چکاپ** / čekāp/: [انگلیسی] اسم. ڕوانینـەوە؛ کـار یـان ڕەوتی لـێ‌ڕوانـین، سـەرنج دان یـان تاقیکردنەوەی شـتێ (وەک موتـوری فڕۆکـە یـان ئەندامگەلی لەشی کەسێ) بۆ زانـینی ئـەوەی کـە ئایا ساغە و دروست کار دەکا یان نە.

**چکاچـــــک** / čakāčak، čekāček/: صــــوت. تسکەتسک؛ شرنگە؛ لەپ‌ـ لەپ؛ شـریخ و هـۆڕ؛ دەنگی وێک‌کەوتنی شیر، کارد و وەکوو ئەوانە.

**چکـــاد** / čakād/: اسـم. [ادبـی] ۱. دون؛ دونـد؛ ترۆپک؛ لووتکە؛ گل؛ دهار؛ پۆپە؛ چـل؛ دوچـک؛ سـەری چیـا ۲. تـەوق؛ تـەپڵ؛ بـەچک؛ بۆڵـی؛ سەرسەر؛ بانی سەر.

**چکـــار** / čekār/: قیـد. [گفتـاری] چـی؛ چـە؛ چ؛ چێش؛ وشەیەک بۆ پرسـینەوە لـە چۆنـاوچۆنی شتێک ‹چکار کنم؟: چی بکەم؟›.

**چکاره** / čekāre/: قید. چکارە؛ وشەیێک کـە بـۆ پرسینی کاری کەسـێ دەگـوترێ ‹داماد چکـارە است؟: زاوا چکارەیە؟›.

**چکامە** / čakāme, čekāme ، ـهـا/:اسم. [ادبی] چامە: ۱. قەسیدە؛ چەکامـە؛ هـۆزان ۲. شـیعر؛

هەڵبەست؛ هۆنراوە ❋ چامە

**چکامـەسـرا** / čakāmesarā, čekāme- /:اسـم. /ادبی/ شاعیر؛ هۆزان؛ هۆزانوان؛ هۆزانڤان؛ هۆنەر؛ هەڵبەستەوان.

**ـ چکـان** / čekān, čakān /: پیـوازە. ـ تکـێن؛ ـچکێن؛ ـچەقان؛ تکێنەر؛ چکێنەر ‹قطرەچکان: تنۆکەتکێن›.

**چکانـدن** / čekāndan, čakāndan /: مـصدر. متعدی. // **چکاندی**: تکاندت؛ **می چکـانی**: دەتکـێنی؛ **بچکـان**: بتکێنـە// ١. تکانـدن؛ داتکانـدن؛ داچۆڕانـدن؛ نقووتانـدن؛ وەرڤـاندن؛ چکانـدن؛ چکـانن؛ چکنـای؛ تکنـەی؛ تکـانن؛ تـراویَ بـە تنۆک ـ تنۆک ڕژاندن ‹هر شب دو قطره بچکان بە چشمت: هەموو شەوێ دوو تنۆکە بتکێنە ناو چاوت› ٢. چرکاندن؛ چرتانـدن؛ چورتانـدن؛ چرکنـەی؛ پەلەپیتکـەی کەرەسـتەیەک ترازانـدن ‹ماشـە را چکاند: پەلەپیتکەی چرکاند›؛ **چکانیدن**. هەروەها: **چکاندنی**

■ صفت فاعلی: **چکاننده** (تکێنەر)/ صـفت مفعـولی: **چکانـده** (تکێنـراو)/ مـصدر منفـی: **نچکانـدن** (نەتکاندن)

**چکاننده** / čekānande, čakānande /: ـها/:اسـم. پەلەپیتکە؛ ماشە؛ جـێ قامکەشـادەی تفـەنگ و هەر ئامرازێکی تفەنگئاسا.

**چکانیدن** / čekānîdan, čakānîdan / ☜ **چکاندن**

**چکـاوک** / čakāvak /: ـ هـا؛ ـان/:اسـم. سـریلە؛ سوریلی؛ زریلە؛ پیزپیزاک؛ سریوە؛ جورە؛ چـوڕە؛ جـڕە؛ جککـە؛ کلاونـە؛ قـازەلاخ؛ قـازلاخ؛ وەیوەیکـەرە؛ چـەکاوەک؛ مـەلێکی بچـووکی بۆری ئامال زەردە.

▣ **چکـاوک شـاخدار**: کلاونـە؛ کلاوکـوورە؛ سۆفیەقیتە؛ فشەکلاونە؛ جۆرێک سـریلەیە لـە سـەر سـەری دوو پـەڕی وەک شـاخ بـەرز بۆتەوە.

**چـک ـ چـک** / čekček /: صـوت. تـک ـ تـک؛ تکە ـ تکە؛ تنۆکە ـ تنۆکە؛ چکە ـ چکـە؛ تکە ـ تـک؛ دەنگی لێک کەوتـنی تنۆکەگـەلی تـراو لەگـەڵ شتێکدا ‹چک ـ چک باران: تکە ـ تکی باران›.

**چکـرز** / čekerz /: اسـم. چکـرز؛ جـۆرێ یـاری فیکریە، وەک دامە، بە سەر پەڕەی شەترەنجەوە لە بەین دووکەسدا کە هەر یەکە دوازدە مۆرەی یەک ڕەنگ و یەک جۆریان هەیە.

**چکسه** / čakse /: ـها/:اسم. [قدیمی] لوولە؛ کاغەزی وەک کەلەقەند پێچراو کە جاران دووکانـداران و بەتایبەت دەرمانفرۆشان شتیان تێوە دەپێچانـد و بە کڕیارانیان دەدا.

**چکش** / čak(k)oš /: ـها/:اسم. چەکوچ؛ چەکوش؛ چـەکویچ؛ چـاکوچ؛ کـاکوچ؛ بـارکوور؛ مـوورە؛ ئاسـنکـوت؛ ئـامێرێکی دەسـتی سـەر پـۆلایی قورس و قایم و دەستە زیاتر لە چێو بۆ کوتانەوە.

▣ **چکش چوبی**: توخماخ؛ هەڵەکوت؛ چەکوچی چێوینە. هەروەها: **چکش فولادی**

**چکشخوار** / čak(k)ošxār /: صفت. چـەکوچخۆر؛ بـە تایبەتمەنـدی چـەکوچخۆری: **چکـشخور** [گفتاری]

**چکـــشخواری** / čak(k)ošxārî /:اسـم. چەکوچخۆری؛ تایبەتمەندیەک لـە کـانزادا کـە ئەگـەر بـەر چـەکوش کـەون، ناشـێکن و وردە ـ وردە، بە شکڵی دڵخواز دەردێن.

**چکـشخور** / čak(k)ošxor /: صـفت. [گفتـاری] چەکوچخۆر؛ چەکوشخۆر.

**چکـش کـاری** / čak(k)oškārî /: ـهـا/:اسـم. چـەکوچکاری؛ چەکوشـکاری؛ کـار یـان ڕەوتی کـارکردن بـە چـەکوچ؛ کوتانـەوەی شـتێ، بەتایبەت کانزا بە چەکوش.

**چکشماهی** / čak(k)ošmāhî /: ـ هـا؛ ـان/:اسم. چەکوش ماسی؛ جۆرێـک کۆسـەیە کـە سـەر و چـاوی ـ وەک چـەکوش ـ لـە هـەر دوو لای لەشیەوە دەرپەڕیوە.

**چکـشی**[1] / čak(k)ošî /: صـفت. چـەکوچی؛

چەکوشـی؛ وەکـوو چـەکوچ؛ چـەکوش‌ئاسـا ‹استخوان چکشی: ئێسکی چەکوچی›.

**چکـشی** [2]: *قید. [مجازی]* بـە پەلـە؛ پەلـە پـەل؛ تون‌ـتـون؛ بـە تالـووکە؛ بەلـەز؛ بـە گـوڕ و تـاو ‹چکشی حرف می‌زد: بە پەلە قسەی دەکرد›.

**چکمـه** / čakme ، ـها/: [ترکـی]/*اسـم.* چەکمـە؛ چەکمێ؛ مانەگەزێ؛ جەزمـە؛ جزمـە؛ ساپۆک؛ پۆستاڵ؛ پووت؛ کەوشی لاسک درێـژی تـا ژێـر ئەژنۆ (زیاتر پلاستیکی).

**چکمیـزک** / čekmîzak/: *اسـم.* میزەچرکـە؛ چرتکـەمیزە؛ میزەچورتکـێ؛ مێزەچرکـێ؛ مێزەچـرکێ؛ میزەچوڕکـێ؛ چرکـەمیزە؛ چرتـە میزە؛ گمێزە چۆرتکێ؛ گمێزە چرکە؛ چرتە مێز؛ گمیـز چورتکـێ؛ کـون میـز؛ نەخۆشـی میـز ڕانەگرتن.

**چکنـده** / čekande, čakande ، ـهـا/: *اسـم. [زمین‌شناسـی]* ئیـستالاکتیت؛ قەنـدیلی ئاهـەکی ئاوێزان لە سرمیچی ئەشکەوتەوە.

**چک و چانه** / čak-o-čāne/: *اسم. [گفتـاری]* دەم و لەوس؛ دەم و لچ؛ لـەر و لـەوس؛ دەم و فـلچ؛ دەم و فلق؛ بەشی خـوارووی دەم ‹آب از چـک و چانه‌اش راه افتاد: لیک لە دەم و لەوسیەوە داچۆڕا›.

▣ **چک و چانه زدن**: چەقەکردن؛ چەقـەـچـەق کردن؛ چەقـە و هـەرا کـردن؛ چەقـە و هـەرا کردن؛ چەند و چوون‌کردن؛ قسەو پێچەقێنی زۆر بۆ سەلماندنی ویستی خـۆ (بەتایبـەت لـە سەودادا) ‹سر مهریه خیلی چک و چانه می‌زدند: لـە سەر مارەیی زۆر چەقەیان دەکرد›.

**چکه** [1] / čekke ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* دلۆپ؛ دلۆپە؛ دلوپ؛ تنۆکە؛ تک؛ تکە؛ دکە؛ چۆڕ؛ چوڕ؛ زیپـک؛ سـافان؛ چکـە؛ جـڕە؛ نقـووت؛ چپـک؛ پەشک؛ شۆرت؛ هوڕە؛ درووپە ‹یک چکـه آب پیـدا نمی‌شد: دلۆپێک ئاو دەست نەدەکەوت›.

▣ **چکه کردن**: دلـۆپەکردن؛ تکـەکردن؛ تنۆکـە کردن؛ دلۆپە دادان؛ چکان؛ وەرفتن؛ تک‌ـتک داچـۆڕانی تـراو لـە شـوێنێکەوە ‹سـقف چکـه می‌کرد: **میچەکە** دلۆپەی دەکرد›.

**چکه** [2]: *صفت. [گفتاری]* ۱. ڕەند؛ ڕند ۲. چەلەنگ؛ تۆڵ؛ تاشـک؛ کەلـەش؛ زرک و زینـدوو؛ زرپ و زینوو ۳. ورد؛ وردبین.

**چکی** [1] / čekî/ ☜ **چک ـ۴**

**چکی** [2]: *قیـد.* یـەکجێ؛ بـە یـەکجاری ‹مـن ایـن آهـن‌آلات را چکـی خریـدم: مـن ئـەم ئاسـنەوالانەم یەکجێ کڕیوە›.

**چکیـــدن** / čekîdan, čakîdan/: *مـصدر. لازم.* // **چکیدي**: تکیای؛ **می‌چکی**: دەتکـێ؛ **بچک**: بتکـێ // تکین؛ تکان؛ چۆڕان؛ چکە/ تکە کردن؛ چکان؛ داچـۆڕان؛ داچۆڕیـان؛ ڤـەچۆڕان؛ ئەرەچکـەی؛ چکـایرە؛ داچکـان؛ نقووتـان؛ چرکـان؛ وەرڤـان؛ تکەـ تکە دارژان ‹از سر تا پایش آب می‌چکید: سـەر تـا پەنجـەی پـای ئـاوی لـێ دەتکـا›. هـەروەهـا: **چکیدنی**

■ صفت فاعلی: **چکنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **چکیده** (تکاو)/ مصدر منفی: **نچکیدن** (نەتکان)

**چکیده** / čekîde, čakîde/: *اسم.* ۱. ـها/ پوختە؛ کورتەی وتار یان نووسراوەیێک کـە مەبەسـت و نـاوەرۆکی نووسـراوەکەی دەربـڕیوە ☜ **چکیده‌نویسی** ‹چکیده‌ی حرفش این بود که بایـد کـار بکنیم: پوختەی قسەکانی ئەمە بـوو کـە دەبـێ کـار بکەین› ۲. ماست چکیده ☜ **ماست** ۳. ـهـا/ *[زمین‌شناسی]* ئیستالاگمیت؛ قەندیلـەی ئاهـەکی کە لە بنی ئەشکەوتەوە هەڵتۆقیوە.

**چکیده‌نامه** / čekîdenāme, čakîde- ، ـها/: *اسم.* پوختەنامە؛ نووسراوەیەک کە پوختەی یەک یان چەند وتاری تێدایە.

**چکیده‌نویسی** / čekîdenevîsî, čakîde-/: *اسم.* کورتەنووسی؛ کورتەنڤیـسی؛ پوختەنووسـی ☜ **چکیده‌ـ۱**

**چگال** / čagāl, čegāl/: *صفت.* ۱. تۆکمـە؛ چـڕ؛ پڕ؛ تۆلا؛ خاوەن بەشگەلی پێکەوە نووساو و چـڕ

۲. قورس؛ تێک ترنجاو.

**چگالش** / čagāleš, čegāleš/: *اسم.* ۱. *[فیزیک]* ڕەوتێ کە تێیدا تراوێک لە هەڵم جویێ دەبێتەوە ۲. کار یان ڕەوتی تۆکمەکردن.

**چگالنده** / čagālande, čegālande ، ـها/: *اسم.* *[فیزیک]* کەرەستەیەک کە هەڵم یان گاز ئەکا بە تراو (زۆرتر لە ڕێی سارد کردنەوەیەوە).

**چگالی** / čagālî, čegālî/: *اسم.* تۆکمەیی؛ تۆلایی؛ پڕی؛ خەستی؛ یەکەی نیشاندەری ڕادەی ماکی هەر شتێک لە سانتیمیترێکی چوارپاڵوودا.

▣ **چگالی جمعیت:** پڕی کۆمەڵ؛ ژمارەی ناونجی خەڵک لە یەکەی ڕووبەردا (وەک دەڵێن پڕی کۆمەڵ لە ئێراندا ۳۷ کەسە بۆ هەر کیلۆمیترێکی چوارگۆشە).

**چگالی‌سنج** / čagālîsanc, čegālî- ، ـها/: *اسم.* پڕی‌پێو؛ کەرەسەی پێوانی پڕی یان کێشی تایبەتی تەنێک.

**چگور** / čogûr, čegûr, čagûr ، ـها/: [ترکی]*اسم.* چەگوور؛ سازێکی ژێداری وەک دووتارە کە لە باکووری ڕۆژهەلاتی ئێران و ئاسیای ناوەندیدا باوە.

**چگونگی** / čegûnegî ، ـها/: *اسم.* چۆنیەتی؛ چلۆنایەتی؛ چۆنایەتی؛ چۆناوچۆنی؛ چۆنەها؛ هاو؛ هاوا؛ مەرەد؛ حاڵ؛ بار؛ مەرە؛ دارەت؛ حاڵەت، دۆخ یان تایبەتمەندی شتێک یا کەسێک (وەک باشی، خراپی، گەرمی، ساردی، سەختی، نەرمی، بەرزی، نزمی، کۆتایی و...) ‹چگونگی کار دستگاه را برای حاضران توضیح داد: چۆنیەتی کاری دەزگاکەی بۆ ئامادەبوان شرۆڤە کرد›.

**چگونه**[1] / čegûne/: *صفت.[ادبی]* چۆن؛ چەین؛ چلۆن؛ چاوان؛ چتۆڤ؛ چتۆ؛ چ‌جۆر؛ چەوا؛ چاوا؛ چاڤا؛ شتۆ؛ شتەو؛ چوین؛ چوون؛ کلۆن؛ خاوەن چ دۆخ، بار یان لۆرێک ‹هوایش چگونه است؟: هەواکەی چۆنە؟؛ چۆن چگونه جایی است؟: شوێنێکە؟›.

**چگونه**[2]: *قید.* چۆن؛ چەنی؛ چلۆن؛ کوو؛ کووسا؛ کووسان؛ کسان؛ کسا؛ کەسین؛ چاوان؛ چتۆڤ؛ چتۆ؛ چ‌جۆری؛ چەوا؛ چاوا؛ چاڤا؛ شتۆ؛ شتەو؛ چوین؛ چوون؛ کلۆن؛ بە چ شێوە، دۆخ یان بارێک ‹چگونه کار می‌کند؟ چگونه رفت؟: چۆن کار دەکات؟؛ چۆن چوو؟›.

**چل**[1] / čel/: *اسم. [مخفف]* چل.

**چل**[2]: *صفت. [گفتاری]* لاژگ؛ گێل؛ لاژ؛ گەمژە؛ گەوج؛ خاوەنی ئاکاری نەگونجاو.

▣ **چل زدن:** پا لە پەیین دان؛ قاز لەوەڕاندن؛ بێ‌ئامانج گەڕان.

**چلاس** / čelās/: *صفت. [گفتاری]* نەوسن؛ چڵێس؛ نوشگل؛ سکەڕۆ؛ زکن؛ گرگن؛ زگ‌لەوەڕین؛ ترخن.

**چلاق** / čolāq ، ـها/: [ترکی] *صفت.* کووچ؛ کوچ؛ گۆج؛ کۆڵ.

▣ **چلاق شدن:** گێڕ بوون؛ کوچ بوون؛ گۆج بوون؛ کۆڵ بوون؛ گێڕ و گەواڵ بوون؛ زیان دیتن یان لە کار کەوتنی دەست یان پێ.

**چلاق کردن:** گێڕ و گەواڵ‌کردن؛ کوچ کردن؛ گێڕ و گۆج‌کردن؛ لە کار خستنی دەست یان پای کەسێک.

**چلاقی** / čolāqî/: [ترکی]*اسم.* گێڕی؛ کۆلی؛ کوچی؛ کێمایی؛ لێنەهاتوویی یان ئاسیو لە دەست و پا کە دەبێتە هۆی لە کار کەوتنیان.

**چلاندن** / čelāndan/: *مصدر. متعدی.* // **چلاندی:** گوشیت؛ **می چلانی:** دەگووشی؛ **بچلان:** بگووشە// گوشین؛ گووشین؛ گەوشاندن؛ گوهاشتن؛ چلانن؛ گوشاین؛ جەڕداین؛ گوشاندن؛ شوارەی؛ شوارتەی؛ شتێ بۆ گرتنی ئاو یان شیرەکەی گوشار دان ‹لباسها را شست و چلاند و روی طناب پهن کرد: جل‌وبەرگەکانی شت و گووشای و هەڵیخست›. هەروەها: **چلاندنی**

■ صفت مفعولی: **چلانده** (گوشراو)/ مصدر منفی: **نچلاندن** (نەگوشین)

**چلپاسه** / čalpāse/: اسم. ۱. /ـها/ مارمێلک؛ مارمەزووک؛ مارمزووک؛ مارمەزووکی؛ مارگیسه ۲. [نجوم] کەلوویەکی چکۆلەیە لە ئاسمانی باکووریدا.

**چل‌تکه** / čeltekke/ ☜ **چهل‌تکّه**

**چلتوک** / čaltûk/ ☜ **شلتوک**

**چلچراغ** / čelčerāq ، ـها/: اسم. چلچرا؛ ئاوێزە؛ چرای چەند لق کە لە مزگەوت و ماڵە گەورانـدا هەڵدەکرێ.

**چلچله** / čelčele ، ـها؛ ـگان/: اسم. پەڕەسێلکە؛ پەڕەسێرکە؛ هەجهەجک؛ حاجی‌ڕەش؛ حاجی‌ڕەشک؛ هاجڕەشک؛ حاجی‌ڕەنگ؛ هەججەجک؛ هەژهەژیک؛ هاجهاجک؛ دومقەسک؛ مەقسوک؛ تەرنەبابیلە؛ پاڵوانە؛ کاردەپەلە؛ پلیزرگ؛ پریزگرد؛ پلووسگ؛ جۆرێ پەڕەسێلکەی گوێسوانان ڕەشی باڵدرێژ و قاچ کورتە.

**چلزیدن** / čolozîdan/ ☜ **چلوزیدن**

**چلغوز** / čalqûz/: اسم. ۱. جیقنە؛ ریقنە؛ ڕێقنە؛ دەڕق؛ زرچ؛ چێرت؛ جیقنەی مەل؛ گووی باڵدار ۲. /ـها/ [تعریض] پووتەکە؛ پووت؛ پووتەک؛ گونەڵ؛ بێنموت و کورت و کز.

**چلغوزه** / čelqûze ، ـها/: اسم. بوندق؛ فستق؛ بەری داری سنەوبەر، لە پستەشامی دەچێ و لە چەرەسدا بە کاری دەبەن.

**چلفتی** / čoloftî/ ☜ **دست‌وپاچلفتی**

**چل‌گیس** / čelgîs/: اسم. پەلکە-پەلکە؛ پەلکێ؛ جۆرێ ئاڕایشتی قژە.

**چلمن** / čolman/: صفت. [گفتاری] ۱. نەگۆمە؛ بێ‌دەست و پا؛ لێ‌نەهاتوو ‹آخر مرد هم این‌قدر چلمن می‌شود؟!: ئاخر پیاو و هێندە نەگۆمە ؟!› ۲. لاژگ؛ گەوج؛ گێل؛ بێ‌ئاوەز؛ لاژێ ‹این پسره خیلی چلمن است: ئەم هەتیوە زۆر لاژگە›.

**چلمنی** / čolmanî/: اسم. ۱. نەگۆمەیی؛ لێ‌نەهاتوویی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لێ‌نەهاتوو بوون ‹باور نمی‌کردم آزاد به آن چلمنی از این کارها بکند: باوەڕم نەدەکرد ئازادی بەو نەگومەییە کاری وا بکا› ۲. لاژگی؛ گەوجی؛ بێ‌ئاوەزی.

**چلنگر** / čelengar, čalangar ، ـها؛ ـان/: اسم. ۱. ئاسنگەر؛ ئاسن‌کار؛ وەستاخاڵە؛ وەستای ئامرازی ئاسن ۲. حەلەبی‌ساز؛ ئەوەی وا بە حەلەبی شت دروست دەکا.

**چلنگری** / čelengarî, čalangarî/: اسم. ئاسنگەری؛ ئاسنکاری: ۱. کار یان پیشەی ئاسنکار ۲. /ـها/ کارگەی ئاسنگەر.

**چلو** / čelow, čolow, čolo:/: اسم. چلاو؛ وشکەپلاو؛ چێشتی لە برنجی کوڵاو و ئاوکێش‌کراو لەگەڵ کەرە یان ڕۆن و خوێدا کە بە خۆرشت یان کەبابەوە دەیخۆن.

**چلوار** / čelvār/: اسم. مۆری؛ مەرمەڕشا؛ هومایی؛ هومایل؛ سەلمەل؛ پارچەیەکی سپی، ناسک و سفت‌چنە.

**چلواربافی** / čelvārbāfî/: اسم. مۆری‌بافی؛ هومایل‌چنی: ۱. کاری جۆلایی مۆری ۲. /ـها/ کارخانە یان ماشێنی بەرهەم هێنانی مۆری.

**چلوپز** / čelowpaz, čolow-, čelo:- ، ـها/: اسم. چلاوپەز؛ چلاولێنەر؛ کەسێ کە کاری لێنانی چلاوە.

**چلوپزی** / čelowpazî, čolow-, čelo:-/: اسم. ۱. چلاوپەزی؛ کار یان پیشەی چلاوپەز ۲. /ـها/ چلاوخانە؛ شوێنی لێنان و فرۆشتنی چلاو.

**چل و چو** / čel-o-čow/: اسم. [گفتاری] دەنگۆ؛ گوتەگوت؛ واتە- واتە؛ گوتەی خەڵک؛ قسە و باسی هەموو جۆرەی ناو خەڵک.

⊡ **چل و چو افتادن**: کەوتنە ناو دەهۆڵەوە؛ قاو داکەوتن؛ دەنگۆ بلاو بوونەوە. هەروەها: **چل و چو انداختن**

**چلوخورش** / čelowxoreš, čolow-, čelo:-/

☜ **چلوخورشت**

**چلوخورشت**/ čelowxorešt, čolow-, čelo:-/: *اسم.* چڵاوخۆرشت؛ چێشتێکی بریتی لە چڵاو و یەکێک لە خۆرشتەکان (وەک: قیمە یان سەوزی): **چلوخورش**

**چلوزیدن** / čolûzîdan/: *مصدر. لازم. [گفتاری]* // **چلوزیدی:** هەڵقرچایت؛ **می چلوزی:** هەڵدەقرچی؛ ـ // هەڵقرچان؛ بە هۆی ڕچیان یان سووتیانەوە بیچمی بنەمایی خۆ لە دەستدان: **چِلُزیدن**

■ صفت مفعولی: **چلوزیده** (هەڵقرچاو)

**چلوکباب** / čelowkabāb, čolow-, čelo:-/: *اسم.* چڵاوکەواو؛ چلەوکەباب؛ چێشتێکە ئێرانی بریتی لە چڵاو و کەبابێ کە بە جیاکار ساز دەبێ و پێکەوە دەخورێ. هەروەها: **چلوگوشت؛ چلومرغ**

▣ **چلوکباب سلطانی:** چڵاو کەواوێک کە هەم کەبابی بەڵگی لەگەڵدایە، هەم کووبیدە.

**چلوکبابی** / čelowkabābî, čolow-, čelo:-، ـها/: *اسم.* چڵاوکەبابی؛ چێشتخانەیێ کە چڵاوکەبابی تێدا دروست دەکەن و دەفرۆشن.

**چلویی** / čeloyî, čoloyî، ـها/: *اسم. [گفتاری]* چڵاوپەز؛ چڵاولێنەر.

**چله** / čelle، ـها/: *اسم.* ۱. چلە؛ چلەمین ڕۆژی ڕووداوێک (بەتایبەت مردنی کەسێک) ‹دیروز چلەی پدرش بود: چلەی نوزاد: دوێنێ چلەی بابی بوو؛ چلەی منداڵی ساوا› ۲. ڕایەڵ؛ تان؛ تاری قاڵی و چنراوەگەلی دەستی ‹چلەکشی گلیم: ڕایەڵ خستنی بەڕە› ۳. لیسپ؛ ژێ؛ کژی بەن یان فرێتێک کە لە چەند تاڵ دروست دەبێت ‹چلەی کمان: ژێ کەوان›.

▣ **چلەی بزرگ:** چلە گەورە؛ چلە گەپە؛ چلە بەرین؛ چل ڕۆژی هەوەڵی زستان.

**چلەی تابستان:** قرچەی تاوسان؛ چلەی هاوین؛ جەنگەی هاوین؛ گەرما و گەرموو هامنی؛ گەرماهی هاڤین. هەروەها: **چلەی زمستان**

**چلەی کوچک:** چلە بچووک؛ چلە بیچکە؛ چلە بەچە؛ چلە دوایین؛ بیست ڕۆژی دوای چلە گەورەوە، لە دە تا سی ڕێبەندان.

▣ **چله گرفتن:** چلەگرتن؛ چلەی مردنی کەسێ گرتن.

**چله نشستن:** چلەکێشان؛ چلە نیشتن؛ چل ڕۆژی بەردەوام لە شوێنێکدا نوێژ و سکاڵا کردن.

**چلەبران** / čelleborān/: *اسم. [قدیمی]* چلە دەرکردن؛ ڕێوڕەسمی چلەمین ڕۆژی زان، کە زەیسانیان دەبردە گەرماو و لەگەڵ بەزم و جەژندا بەڕێوە دەچوو.

**چلەریسک** / čellerîsak/: ☜ **چَرخریسک**

**چلەکشی** / čellekešî، ـها/: *اسم.* ڕاهێڵکێشی؛ کار یان ڕەوتی تەون نانەوە؛ خستنی ڕاهێڵی ئەستوونی بە رووی دارتەون یان ماشێنی جۆلاییدا.

**چلیپا** / čalîpā، ـها/: [آرامی] *اسم. [ادبی]* خاچ؛ خاچ؛ سەلیب.

**چلیک** / čelîk، ـها/: [روسی] *اسم.* ۱. تەنەکە؛ پووت ۲. بۆشکە؛ بەرمیل؛ چەلنگ؛ چەلیک.

**چم** / čam/: ☜ **چَم و خَم**

**چماق** / čomāq، ـها/: [ترکی] *اسم.* ۱. گۆپاڵ؛ گالۆک؛ گالۆم؛ گود؛ زۆلاخ؛ پەیاغ؛ پەیاخ؛ تەیاخ؛ تێلا؛ زنج؛ کوتەک؛ زۆپ؛ زۆپک؛ زۆپا؛ زۆپە؛ کۆپار؛ کوپار؛ تەرک؛ کێتە؛ زاکۆر؛ شاپان؛ بەرچیغ؛ بەرچیت؛ کجیر؛ دۆق؛ تۆیز؛ لیس؛ داردەستی پتەو و سەر بەگرێ ۲. *[کنایی]* داردەست؛ ئامرازی هەڕەشە ‹لیبرال هم چماقی شده بر سر مخالفان: لیبراڵیش بۆتە داردەستێک بۆ گیانی نەیاران›.

**چماقدار** / čomāqdār، ـها؛ ـان/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* گۆپاڵدار؛ تێلابەدەست؛ کێتەهەڵگر؛ کەسێ کە بە کوتەکەوە گەف و گوڕ دەکا و نەیاران و سەرپێچکاران ئازار دەدا ‹چماقداران ریختند توی

تظاهرات و آن را به هم زدند: گۆپالدارەکان ڕژانە نێو خۆپیشاندانەکەوە و شێواندیان›.

**چمباتمه** / čombâtme/: [ترکی]/اسم. چینچک؛ چنچک؛ چیچڵە؛ جینجک؛ جنینچکە؛ قلینچکە؛ تووتەک؛ هەڵتووتەک؛ هەڵتروشک؛ توولنج؛ قنچک؛ ترووشک؛ قوونەڵتس؛ قەلەفیسک؛ سەرتووتک؛ دون؛ چوقم؛ چی‌چی؛ گەماڵفس؛ دوتین‌جگ؛ دترنجک؛ دانیشتن لە سەر هەر دوو پێ بە شێوەیێ کە زرانی هەڵسێتە بەر سنگەوە: **چنبک؛ چندک**

▣ **چمباتمە زدن:** ترووشکان؛ هەڵترووشکان؛ هەڵتووتەکان؛ هەڵتووتان؛ هەڵتووترین؛ هەڵتروشکان؛ هەڵتروشکین؛ قلینچکە/ جنینچکەدان؛ چوقم‌داین؛ سەر چینچک نیشتن؛ بە چینچکانەوە دانیشتن؛ قوونتس دانەوە.

**چمپا** / čampā/: اسم. چەمپا؛ جۆرە برنجێکی گردی ئێرانیە.

**چمچه** / čamče، ـها/: [ترکی]/اسم. کەوجێز؛ ئەسکوێ؛ ئەسکوو؛ هەسک؛ چمچە؛ چووچک؛ چەمچە؛ چەمچک؛ کەوچکی دارینی گەورە بۆ هەڵگۆزانی تراو.

**چمدان** / čamadān, čamedān، ـها/: [روسی از فارسی]/اسم. جانتا؛ چەمەدان؛ چیمانی؛ چەنتەی سەفەر؛ ساکی گەورە و چوارگۆشی لە چەرم و ماکی دەسکرد بۆ جلک و تۆشە تێنان ‹یک چمدان لباس خریده بود: پڕ جانتایەک جلکی کڕیبوو›.

**چمن** / čaman، ـها/: اسم. چیمەن: ۱. چیم؛ چەمەن؛ فرس؛ فرێز؛ فرووزوو؛ فرووزی؛ فریز؛ ڕوەکێکی هەمیشە سەوزی گەڵا تەسک و درێژی بێ‌ساقەتەیە کە لە باخچەدا دەچێنرێ ‹باغچەهای وسط را چمن می‌کاریم: باخچەگەلی ناوەڕاست دەکەینە چیمەن› ۲. مێرگ؛ سەوزەڵانی؛ شەکار؛ بژوێن ‹بچەها توی چمن بازی می‌کردند: منالەکان لە نێو چیمەنەکەدا کایەیان دەکرد›.

**چمنزار** / čamanzār، ـها؛ ـان/: اسم. سەوزەڵانی؛ سەوزەڵانێ؛ سەوزایی؛ شینایی؛ سەوزەجاڕ؛ گیاجاڕ؛ مێرگزار؛ مەرەن؛ پاناییەک لە زەوین کە چیمەنی تێدا ڕوابێ ‹در چمنزار کنار ده چادر زدیم: لە سەوزەڵانی قەراخ گوندەکە خێوەتمان هەڵدا›.

**چمن‌زن** / čamanzan، ـها/: اسم. چیمەن‌بڕ: ۱. کەسێ کە چیمەن دەپەرتێوێنێ ۲. کەرەسەیێ بۆ کورت‌کردنەوە و ڕازاندنەوەی چیمەن. هەروەها: **چمن‌زنی**

**چمن‌کاری** / čamankārî/: اسم. ۱. چیمەن‌کاری؛ کار یان ڕەوتی چیمەن‌کاڵین؛ چاندنی چیمەن ‹باید تمام اینجا چمن‌کاری شود: دەبێ تەواوی ئێرە چیمەن‌کاری بێ› ۲. ـها/ سەوزەڵانی؛ سەوزەڵانێ؛ شینایی؛ زەوینێ کە چیمەنی تێدا چاندرابێ ‹نگذار بچەها بروند توی چمن‌کاری: مەهێڵە منداڵان بچنە ناو سەوزەڵانیەکەوە›.

**چمنی** / čamanî/: صفت. چیمەنی: ۱. چیمی؛ سەوزی؛ پێوەندیدار یان سەر بە چیمەنەوە ۲. چەمەن ڕەنگ؛ سەبزی چیمەنی.

**چم و خم** / čam-o-xam، ـها/: اسم. ۱. فیچان؛ قیل‌قاچ؛ پێچاوپێچ؛ قەنچاوپێچ؛ پێچ ـ پێچ؛ خوارەوخوار؛ پێچەڵپاچ؛ پێچەکە و خوارەکە؛ پێچ و چەماوە بەتایبەت بە شێوەی پێچگەلی لە شوێن یەک ۲. [مجازی] وردەکاری ‹مدتی طول کشید تا چم‌وخم کار را یاد گرفتم: ماوەیەکی خایاند تا فێری وردەکاری کارەکە بووم› * **چم**

**چموش** / čamûš، ـها/: صفت. شەمووز؛ شەمبووز؛ شەمووس؛ شەغموور؛ چەمووش؛ چەمیش؛ شمووز؛ توخس؛ هەرووم؛ شەهموز؛ لەچەر؛ ڕەوەک؛ سڵ؛ چاراغ؛ تووش؛ تۆسن (بەتایبەت بۆ چوارپێیان) ‹این قاطر چموش است، مواظب باش!: ئەم قاترە شەمووزە، وریا بە!›.

**چمیدن** / čamîdan/: مصدر. لازم. [ادبی]

// **چمیدی**: چەمایەوە؛ **می چمی**: دەچەمیەوە؛ **بچم**: بچەمـەوە// ١. لەنجـەکردن؛ خـنگلین؛ بـە لار و لەنجـە ڕۆیـشتن ٢. چـەمان؛ چەمانـەوە؛ چەمینەوە؛ چـەمیایوە؛ ئەوەچەمیـەی؛ چـەمین؛ نەوینەوە؛ نووچانەوە؛ مووچانە؛ باو خواردن؛ پـێچ خواردن؛ هەڵپێچان.

■ صفت فاعلی: **چمنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **چمیده** (چەماوە)/ مصدر منفی: **نچمیدن** (نەچەمانەوە)

**چنـار** / čenār ، ـهـا؛ ـان/:/اسم. دارپەڵـک؛ دارجەوهـەر؛ هـۆلێر؛ دارتـویکڵ؛ سـوورەچنار؛ دارێکی قایم بە تۆکڵی لووس و بۆری ئاماڵ‌سەوز و گەڵای پەنجەییەوە کە چێوەکەی بەنرخە و بە کەڵکی زۆر کار دێ.

**چنان**[1] / čenān, čonān/: *صفت*. وا؛ ئـاوا؛ وەهـا؛ ئاوەها؛ چامنێ؛ چامنە؛ پاسە؛ پاسێ؛ چنەو؛ چنۆ؛ چنوو؛ بە وێکچوونی، چۆنیەتی یـان چەندیـەتی ئاماژەپێکراو ‹چنان کـاری هـم نبـود: کـارێکی واش نەبوو›: **آنچنان** [ادبی]

**چنان**[2]: *قید*. وا؛ وەها؛ پاسە: ١. ئەوەنـد؛ ئەمەنـە؛ ئەوندە؛ عەمەنە؛ ئەونە؛ ئەقـەڕە؛ ئێقـرە؛ عـەقرە؛ ئەیقەرە؛ ئانـە؛ ئیندە؛ ئیننە؛ هۆسا؛ ئاپاسە؛ تا ئەو ڕادە ‹چنان بلند بود کە دست کسی بە آن نمی‌رسید: وا بـەرز بـوو دەسـتی کەسـی پێـی نەدەگـەیـشت› ٢. جۆرێ؛ جۆرێک؛ چەشنێ؛ چەشنێک؛ جۆرێو؛ بەو جۆرە؛ بە جۆرێ؛ بە جۆرێک؛ بە چەشنێ؛ بە چەشنێک ‹چنان می‌رفت کە باد بـە او نمـی‌رسید: وا دەڕۆیشت بای پێ نەدەگەیشت› ✻ **آنچنان** [ادبی]

**چنان**[3]: ضمیر. ئاوەها؛ وا؛ پاسە؛ وەها؛ ئاوا؛ چامنە؛ ئەو کەسە یان ئەو شتە کە پێشتر یادی لێکـراوە ‹چنان کسی بە درد اینجا نمی‌خورد: ئاوەها کەسـێ بـە کەڵکی ئێرە نایەت›: **آنچنان** [ادبی]

**چنانچە** / čenānče, čonānče/: حـرف. ١. ئەگەر؛ ئـەر؛ هەگـە؛ هەگـەر؛ ئەگـەریش؛ ئەگـەریچ؛ ئەگەتەی؛ هەگەتەی؛ ئەرکـەتێ؛ ئەگەرکەتـەی؛ ئەگەرەکەتێ؛ ئەگەرکوو ‹چنانچە خواستی بیایی، مرا خبر کن: ئەگەر ویستت بی، هەواڵم دەیە› ٢. هەروا؛ هەرواکـە؛ هەروەهاکـە؛ هەرپاسـەکە ‹چنانچـە در گذشتە اشارە شـد: هـەروا کـە لـە ڕابـردوودا ئامـاژەی پێکرا›.

**چنانکـە** / čenānke, čonānke/: حـرف. وەک؛ هەروەک: ١. ئەگـەریش؛ ئەگـەریچ؛ ئەگەتـەی؛ هەگەتەی ٢. هەروا؛ هەروەها؛ هەرپاسـە؛ واکـە؛ پاسەکە؛ ئەو جۆرە ‹چنانکە می‌دانیـد، مـن یـک مـاه اسـت در اینجـا هـستم: وەک دەزانـن، مـن مانگێکـە لێرەم›.

**چنبر** / čambar, čanbar/:/اسم. کەوانـە؛ کەمـە؛ خەپرە؛ پەپکە؛ پاپۆکە؛ ئاخڵە؛ گەرزک؛ چەنبـەر؛ چەمەر؛ هەر شتێکی ئاڵـقەچن یـان پێچـاوپێچ: **چنبرە**

◘ **چنبر زدن**: پەپکـە دان؛ پاپۆکـە دان؛ پەپکـە بەسـتن؛ پەپکـە خـواردن؛ ئاخـڵە دان؛ پـێچ خواردن؛ بە شێوەی ئاڵقە-ئاڵقە لە سەر یەک کەوتن ‹یک مار سیاه وسط رختخوابم چنبر زدە بود: ڕەشمارێک لە ناو جێگەکەمدا پەپکەی دابوو›.

**چنبرە** / čambare, čanbare/ ☜ **چنبر**

**چنبک** / čombak, čonbak/ ☜ **چمباتمە**

**چنتـە** / čante ، ـهـا/:/اسم. توورەکـە؛ تـوووەرە؛ تیوەرە؛ چـەنتک؛ هەگبـە؛ چەنتـە؛ کیـسەیەکی گەورەی بەندار کە شـتی تێـدەنێن و دەیکەنـە شانەوە.

◘ **در چنتە داشتن**:/کنایی/ لـە ژێـر (بـن) سـەردا بوون؛ پێ‌بوون ‹صد تا حقە و کلک در چنتە داشت: گەڕ و گوڕی زۆری لە بن سەردا بوو›.

**چنجە** / čance/:/اسم. پـل؛ پـەل؛ تکـە؛ چنجـە؛ قۆزباشی؛ پارچە گۆشتی چکۆلە: **چنچە**

**چنچە** / čanče/:/اسم. ☜ **چنجە**

**چند**[1] / čand/: *صفت*. چەند؛ چەن؛ چـن؛ چنـد: ١. بۆ پرسیار لە هەندی شـت ‹چنـد سـال داری؟: چـەن سالـتە؟› ٢. چـەنێک؛ چقـا؛ چقـاس؛ بـۆ پرسینی نرخی شتێک ‹سیب کیلویی چنـد اسـت؟:

سێو کیلۆیێ چەندە؟›.

**چند**[٢]: ضمیر. چەند؛ چەن؛ چن؛ برێ؛ بازێ؛ برێک (کەمتر لە ١٠) ‹چند نفر آمده بودند: چەند کەس هاتبوون›.

**چند-**[٣]: پیشوا‌ژە. چەن-؛ چەند-؛ چن-؛ بە زۆرتر لە دوو دانە لە شتێ ‹چند ماهە: چند رنگ: چەن مانگە؛ چەن ڕەنگ›.

**چندان**[١] / čandān/: صفت. زۆر؛ فرە؛ فریە؛ وەها؛ ئێجگار؛ گەلەک؛ گەلەکی ‹چندان ارزشی ندارد: بایەخێکی زۆریشی نیە›.

**چندان**[٢]: ضمیر. [ادبی] هێندە؛ ئەوەندە؛ ئەوەنە؛ ئەونە؛ ئاننە؛ ئاندە: ١. چەندان؛ ئەوهەندە؛ ئاقرە؛ ئێقرە ‹نە چندان بخور کز دهانت برآید: هێندە مەخۆ لە زارتەوە بێتەوە› ٢. هەر ئەو هەندە ‹پس از ازدواج مشکلاتش دو چندان شد: دوای زەماوەندی گیر و گرفتی بوو بە دوو هێندە›.

**چندانحصاری** / čand'enhesārî/: [فارسی/ عربی] اسم. [اقتصاد] بەرهەم هێنان یان بلاوکردنەوەی پاوانکراوی کالایەک لە لایەن دوو یان چەند کەس یان دامەزراوەوە بە شێوەیەکی یەک گرتوو کە بتوانن لە هەلاجانی نرخ بەرگری بکەن (وەک بۆ مۆز لە دنیادا دەکرێ).

**چندبر** / čandbar/ ☜ **چندضلعی**

**چنددستگی** / čand.dastegî/: اسم. چەندبەرەکی؛ چەن دەسەیی؛ چەن پەلی؛ چەن بری؛ دۆخ یان چۆنیەتی گرۆ-گرۆ کەوتنی کۆمەڵێک لە ئاکامی ناکۆکی نێوانیان ‹در آستانەی انتخابات میانشان چنددستگی پیدا شد: لە ئاسانەی هەڵبژاردندا چەندبەرەکی کەوتە نێوانیان›.

**چندرغاز** / čenderqāz/ ☜ **شندرغاز**

**چندزبانگی** / čandzabānegî/: اسم. چەن زوانی؛ چەندزمانی؛ دۆخ یان چۆنیەتی پەیڤینی خەڵک بە چەن زمان لە ناوچە یان مەڵبەندێکدا.

**چندش** / čendeš/: اسم. ١. مووچرکە؛ مووچرک؛ مووچرکی؛ تەز؛ تەزوو؛ گریزانک؛ گڤردی؛ گڤوردی؛ شەوت؛ تەزێکی سووک کە بەهۆی دیتن یان بیستنی شتی ناخۆش یان بە هۆی سەرماوە لە لەشدا بەدی دێ ‹باد سردی وزیدن گرفت و چندشم گرفت: کزەیەک هەڵیکرد، مووچرکەم پێدا هات› ٢. [کنایی] قیز؛ بێز.

**چندش آور** / čendešāvar/: صفت. ١. مووچرکەهێن؛ تەزووخەر؛ هۆی چێبوونی مووچرک ٢. [کنایی] بێزەون؛ قیزەون؛ هۆی بێز هاتنەوە و دڵ هەڵشێوان.

**چندشکلی** / čandšeklî/: [فارسی/ عربی] اسم. چەن بیچمی؛ چن نژمی؛ تایبەتمەندی بوونە بلوور، بە چەند بیچمی جیاواز و ناسراو.

**چندضلعی** / čandzel'î، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. چەن سووچ؛ چەن گۆشە؛ بیچمی هەندەسی تەخت کە زۆرتر لە چوار گۆشەی هەبێ: **چندبر؛ چندگوشه**

**چندک** / čondak/ ☜ **چمباتمه**

**چندکاره**[١] / čandkāre/: اسم. چەن کارە؛ کەرەسەیەک (زۆرتر) کارەبایی بۆ وردکردن، هارین، تێکەڵ کردن و توێ کردنی ماکی خۆراکی.

**چندکاره**[٢]: صفت. چەن کارە؛ خاوەنی تیکەگەلی تایبەت بۆ ئەنجامدانی چەن کاری جۆراوجۆر ‹چکش چندکارە: چەکوچی چەن کارە›.

**چندگانگی** / čandgānegî/: اسم. جۆراوجۆری؛ چەندوانەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی جۆراوجۆر بوون.

**چندگانه** / čandgāne/: صفت. چەندانە؛ بە زۆرتر لە یەک توخم، بیچم یان چۆنیەتیەوە.

**چندگوشه** / čandgûše/ ☜ **چندضلعی**

**چندم** / čandom/: صفت. چەندەم؛ چەنم؛ چەنوم؛ چنم ‹آزاد چندم شد؟: ئازاد بوو بە چەندەم؟›.

**چندمنظوره** / čandmanzûre/: [فارسی/ عربی] صفت. چەنددۆزە؛ چەند مەبەستە؛ گەلالە کراو

بۆ چەند کاری جیاواز ‹ماشین چندمنظوره: ماشێنی چەنددۆزە›.

**چندوجهی** / čandvachî، ـها/: [فارسی/ عربی] /اسم. چەند پاڵوو؛ بیچمی هەندەسی بە زۆرتر لە چوار ڕووبەری کەناریەوە.

**چند و چون** / čand-o-čûn/: /اسم. چۆناوچۆنی؛ چەن و چلۆن؛ چۆن و چلۆنی؛ چەند و چۆنی؛ چەن چۆنی؛ چەندیەتی و چۆنیەتی؛ هەند و چۆناوچۆنی ‹وقتی چند و چون کار را درست فهمیدی به من خبر بده!: کاتێ چۆناوچۆنی کارەکەت باش زانی ئاگادارم کە!›.

**چندهمسری** / čandhamsarî/: /اسم. چەن هاوسەری؛ ژیانی یەک پیاو لەگەڵ زۆرتر لە یەک ژندا یان بە پێچەوانە. بەرانبەر: **تک‌همسری**

**چندی** / čandî/: /اسم. [ادبی، نامتداول] بڕێ؛ بڕێک؛ هەندێک؛ چننی؛ دۆخ یان چۆنیەتی چەند دانە بوون ‹در این جنگ بسیاری کشته شدند و چندی هم گریختند: لەم شەڕەدا زۆرێک کوژران و بریکیش هەڵاتن›.

**چندی** / čandî:/: ضمیر. هێندێک؛ چەندێک؛ چەندێ؛ چەنێ؛ چننێوە؛ دەمێک؛ سەردەمێ؛ سەردەمانێ؛ ماوەیەک؛ هێما بە ماوەیەکی نارِوون ‹چندی گذشت و از او خبری نشد: هێندێکی پێچوو و هەواڵێکی نەبوو›.

**چندین** / čandîn/: صفت. چەن؛ چن؛ چەند؛ بە ژمارەی زۆرتر لە سێ دانە ‹چندین بار او را دیده‌ام: چەن جارێ دیتوومە›.

**چنگ**[1] / čang/: /اسم. ١. چنگ؛ چنگی؛ چرنووک؛ چەپڵ؛ پەنج؛ پەنجە؛ ئەو بەشە لە دەست کە کۆی ئەنگوستان پێک دێنێ ‹توی چنگت بود: لە نێو چنگتدا بوو› ٢. /ـها/ [موسیقی] چەنگ؛ سازی ژێدار کە حەوت سیمی هەیە و بە ئەنگووست لێدەدرێ ٣. [موسیقی] چەنگ؛ یەکەی کات لە نوتی مووسیقادا کە درێژەی بەرامبەری نیوەی ڕەشێک و دوو ئەوەندەی دولاچەنگێکە.

▣ **چنگ انداختن:** ١. چنگ/ چنگووڕگرتن؛ بە نینۆک و ئەنگوستان زەبر گەیاندن بە شتێ ‹چنگ انداخت تو صورتم: چنگی گرت لە دەم و چاوم› ٢. چنگ/ دەست بردن؛ چنگی شەی؛ دەس کێشان؛ پەنجەی دەست بۆ گرتنی شتێ ئەنگاوتن ‹چنگ انداخت و سر طناب را گرفت: چنگی خست و سەر تەنافەکەی گرت› ٣. [کنایی] چنگ خستن؛ دەست بردن؛ دەسدرێژی کردن ‹چنگ انداخت روی اموال زنش: چنگی خستە سەر دارایی ژنەکەی›.

**چنگ زدن:** ١. چنگ‌گرتن؛ چرنووک گرتن؛ چنگ داین؛ چنگی پێکەی؛ کڕاندن بە نینۆک لە سەر شتێ ‹گربه صورتش را چنگ زد: پشیلە چنگی‌گرت لە دەم و چاوی› ٢. چنگ‌خستن؛ چنگ پێدا کردن؛ شتێ گرتنە چنگی خۆوە ‹چنگ زد و یک مشت از موهایم را کند: چنگی‌خست و چەپکێ لە قژمی هەڵکەند› ٣. چەنگ لێدان ‹خانمی توی فیلم چنگ می‌زد و شوهرش آواز می‌خواند: ئافرەتێ لە فیلمەکەدا چەنگی لێدەدا و مێردەکەی گۆرانی دەگوت›.

**چنگی به دل نزدن:** [مجازی] باو دڵ نەبوون؛ سەرنج ڕاکێش یان خۆش نەبوون ‹برنامه‌های تلویزیون چنگی به دل نمی‌زند: بەرنامەکانی تەلەڤیزیۆن باوی دڵ نین›.

**به چنگ آوردن:** بە چنگ هێنان؛ چنگ خستن؛ وەگیر خستن؛ بەدەس‌هێنان ‹آخرش آن توپ را به چنگ آورد: ئاخری ئەو تۆپەی چنگ خست›.

**در چنگ کسی بودن:** [کنایی] لە ژێر چنگی کەسێدا بوون؛ لە دەست یان لە بەر دەستی ئەودا بوون ‹هر جا بروی باز در چنگ منی: هەر کوێ بڕۆی هەر لە ژێر چنگمدای›.

**چنگ**[2]: صفت. [گفتاری] وشک؛ گۆج؛ ڕەق؛ لە گۆجوو؛ لە گۆچووگ؛ (لەمەڕ ئەندامگەلی

لەشەوە) ‹دستم از سرما چنگ شده بود: دەستم لە سەرما گۆج ببوو›.

**چنگال** / čangāl/: *اسم.* ۱. / ـها/ چنگاڵ؛ چەنگاڵ؛ چەتاڵ؛ ملێبۆک؛ قولاب؛ کولاب؛ لاپوشک؛ ئامرازێکی چوار لەقی هەواڵی کەوچکە لە نان خواردندا ‹تکەای از گوشت را با چنگال برداشت: پلێ لە گۆشتەکەی بە چنگاڵ هەڵگرت› ۲. /ـها/ چنگ؛ چنگی؛ چرنووک؛ چنگۆرک؛ چەپۆڵە؛ چەپاڵە؛ چەمۆڵە؛ قەرمووشک؛ خەرمووش؛ خەرمووشەک؛ پەنجە و هەنگووسی گیانلەبەرانی ڕاویار ۳. هەرمێشک؛ هەرووشک؛ جۆرێ چێشتی ئێرانی کە بە نانی وردکراو و ڕۆن و شەکر چێ دەبێ.

**چنگر** / čangar/: *اسم.* گامارۆڵە؛ گامارۆ؛ گامارووڵە؛ ڕەش‌بەش؛ کوڕەبەشە؛ مریشکە ڕەشە؛ مریشکەحەبەشی.

**چنگک** / čangak، ـها/: *اسم.* شەن؛ شەنە؛ چەنگە؛ چنگە؛ قەلاگ؛ قەلاگە؛ قەلانگ؛ چەنگاڵ؛ چنگاڵ؛ ئامێرێکی تیژ و چەماوە بۆ گرتن، دالەقاندن یان کێشانی شتێ ‹با چنگک سطل را از چاه بیرون کشید: بە شەنە سەتڵەی لە چا دەرهێنا›.

**چنین**[1] / čenîn, čonîn/: *صفت.* ئاوا؛ ئاوەها؛ ئاوها؛ وەها؛ وەی؛ وا؛ وە؛ بەمجۆرە؛ ئەمجۆرە؛ هێن؛ ها؛ هن؛ هاه ؛ بەو چەشنە؛ نی؛ هالوتاولۆ؛ وەو تۆ؛ هێدینا؛ هونی؛ هوسا؛ پیسە؛ ئی‌پیسە؛ چیمنە؛ ئی‌چیمنە؛ بە ئەم بیچم، چەندیەتی یان چۆنیەتیەوە ‹چنین چیزی ندیده بودم: ئاوا شتێکم نەدیبوو›: **این‌چنین** *[ادبی]*

**چنین**[2]: *قید.* *[ادبی]* وا؛ وە؛ ئاوا؛ ئاوەها؛ ئاوها؛ وەی؛ ئەمجۆرە؛ بەم جۆرە؛ هێن؛ ها؛ هن؛ هاه ؛ بەو چەشنە؛ نی؛ هالوتاولۆ؛ وەو تۆ؛ هێدینا؛ هوسا؛ هونی؛ پیسە؛ پێسە؛ بەم چەشنەیە؛ وەکوو ئەمە ‹چنین گفت: وای گوت›: **این‌چنین** *[ادبی]*

**چنین**[3]: *ضمیر.* ئاوا؛ وا؛ وە؛ وەی؛ ئاوەها؛ ئاوها؛ ئەمجۆرە؛ بەم جۆرە؛ هێن؛ ها؛ هن؛ هاه ؛ بەو چەشنە؛ نی؛ هالوتاولۆ؛ وەو تۆ؛ هێدینا؛ هوسا؛ هونی؛ پیسە؛ پێسە؛ ئی‌پیسە؛ چیمنە؛ هەر ئەم کەسە یان هەر ئەم شتە کە لەمەو پێش یادی کراوە ‹چنین است رسم روزگار: ئاوایە دابی دەوران›: **این‌چنین** *[ادبی]*

**چو** / čow, čo:/: *اسم.* *[گفتاری]* دەنگۆ؛ گوتی‌ـگوتی؛ وتی‌ـ وتی؛ گوتەـگوتە؛ قوو؛ تەقە؛ چرـچر؛ چاووڕا؛ شات‌وشووت؛ قسە و باسی هەموو جۆرەی ناو خەڵک.

▣ **چو افتادن**: قوو داکەوتن؛ قسە داکەوتن؛ تەقە داکەوتن؛ قاڵ دەرچوون؛ وتی‌ـ وتی هەستان؛ وتی‌ـ وتی داکەوتن؛ قسە لە سەر زاران کەوتن ‹چو افتاده بود عروس فرار کرده: قوو داکەوتبوو بووکەکە هەلاتووە›.

**چو انداختن**: قوو داخستن؛ وتی‌ـ وتی داخستن؛ وتی‌ـ وتی بلاوکردنەوە ‹همه جا چو انداختند کە زلزلە می‌آید: لە هەموو لا قوویان داخست بوومەلەرزە دێ›.

**چو** / čo/: *حرف.* *[مخفف، ادبی]* کاتێ؛ کە؛ چون؛ چوون ‹چو فردا برآید بلند آفتاب ...: بەیانی کاتی کە هەتاو بەرز هەلات...›.

**چوب** / cûb، ـها/: *اسم.* ۱. چێو؛ چۆ؛ چوو؛ بەشی تۆکمەی دار و دارچک کە بەتایبەت کۆتەرەکەی پێک دێنێ ‹چوب گردو خیلی قیمتی است: چێوی گوێز زۆر بەنرخە› ۲. *[مجازی]* چیلکە؛ چێلگ؛ چوکوڵ؛ ئێزینگ؛ هێزم؛ چوو؛ دار ‹رفتیم برای اجاق کمی چوب جمع کردیم: ڕۆیشتین بۆ سۆبە هێندێ چیلکەمان کۆ کردەوە› ۳. دار؛ درەختی بڕدراو کە هێشتا بە شێوەی تەختە دەرنەهاتووە ‹چوبها را بار زدند و از جنگل بردند: دارەکانیان بار کرد و لە جەنگەڵیان بردن› ٤. *[کنایی، گفتاری]* پارە؛ پووڵ؛ بەتایبەت یەکەی پارە ‹چند چوب بالاش

دادی؟: چەندت پارە لە سەری ڕۆیوە›.

**چوب الف** ☜ **چوبالف**

**چوب پرده:** چێو پەردە؛ چۆ پەردە؛ چێو یان کانزایەکی درێژ و باریک کە لە سەرووی پەنجەرەوە دادەبەسرێ و پەردەی پێوە هەڵدەواسن.

**چوب تعلیم:** چێوتالیم؛ چێوێکی کورت و خەڕاتی کراو و ڕازاوە، کە ئەفسەران بە دەستیانەوە دەگرت.

**چوب دو سر طلا:** *[مجازی]* لە هەردوو جەژنان بووگ؛ چێوی هەردوو سەر تەلا/ گوواوی؛ کەسێ یان شتێ کە لە لای هەموانەوە (بەتایبەت لای دوو یان چەند کەس یا گرۆی بەرانبەرەوە) بێنرخ و ناوخراپ بووبێ.

**چوب زیر بغل:** چێوشەقە؛ دارشەق؛ دار هەنگڵ؛ چێوی بنهەنگڵ؛ کەرستەیەکی لە چێو یان ئالومنیۆم بۆ نەخۆشی پێشکاو یان کەسێ کە پێی گەزەنی دیوە، کە یەک یان جووتێکی بخاتە ژێر باڵیەوە و پێوەی بڕوا.

**چوب سفید:** چێوی سپی؛ چێوی سپیدار و دارگەلی بێ بەرگە.

**چوب سیگار:** مۆدنە؛ دەملە؛ دەمنە؛ دەمنە سیگار؛ دەمسکار؛ دەمەسگار؛ باسک؛ دار جغار؛ قۆسە؛ دار جگەرە؛ لوولەی باریک و ناو قرۆڵ کە جگەرەی پێدا دەکەن و دەیکێشن.

**چوب قلم:** سەرە قەڵەم؛ میلەیەکی بن کۆلیو کە لە سەر مێزی دادەنێن و قەڵەمی تێدەخەن، ڕایدەگرێ.

**چوب کبریت:** نفت؛ چلە شەمچە؛ چڵە شخاتە؛ زلوک؛ دەنکە شەمچە؛ زللک؛ چوکڵە گۆگرد؛ چۆکلە شقارتە؛ چوکلە شەمچە.

**چوب مرکزی:** قلب چوب ☜ **قلب**

▣ **چوب بە لانەی زنبور فرو کردن:** *[کنایی]* چیلکە کردنە کونی زەرگەتەوە؛ هێلانەی زەردەواڵە شێواندن؛ سەگی نووستوو وە خەبەر هێنان؛ شەڕ هەڵگرانن/ ئاڵۆزانن/ هەڵخڕاندن / نیانەوە/ هەڵگرسانن/ وە پاکردن؛ گۆتاڵ و پشێوی خۆش کردن.

**چوب توی آستین کسی کردن:** *[کنایی]* کەسێ توخماخ کردن؛ کەسێک بە داهۆڵدا کردن؛ کەسێ بە سەختی ئازار دان ‹اگر پدرت بفهمد چوب توی آستینت می‌کند: ئەگەر باوکت بزانێ توخماخت ئەکا›.

**چوب چیزی/ کسی را خوردن:** *[کنایی]* شەقی شتێ/ کەسێ خواردن؛ گووی شتێ/ کەسێ شێلان؛ بە بۆنەی کەسێ یان شتێکەوە تووشیاری سزا یان زەحمەت و زیان بوون ‹هنوز بعد از ۲۰ سال، چوب حزبی بودنش را می‌خورد: هێشتا دوای ۲۰ ساڵ، شەقی حیزبی بوونی دەخوا›.

**چوب حراج چیزی را زدن:** ئاگر نانە شتێکەوە؛ هەرزان و تاڵان دان؛ هەڕاج کردن؛ شمەکێ هەڕاج کردن یا زۆر هەرزان فرۆشتن.

**چوب خوردن:** چێو/ کوتەک خواردن؛ تێلا کوت کران؛ کوتەککاری کریان؛ بە چێو و دار کوتەک خواردن. هەروەها: **چوب زدن؛ بە چوب بستن**

**چوب لای چرخ کاری گذاشتن:** *[مجازی]* چوکلەشکێنێ کارێک کردن؛ بەرد خستنە ڕێ کارێ؛ قۆرت دەکارێ خستن؛ چەت تێخستن؛ بەرهەڵست خستنە بەر کار و بارێکەوە ‹مخالفان چوب لای چرخ انتخابات می‌گذارند و مشکل می‌تراشند: نەیاران لە هەڵبژاردنەکاندا چوکلەشکێنی دەکەن و گەڕ و گێچەڵ دەتاشن›. هەروەها: **چوب لای کار کسی گذاشتن**

**همه را بە یک چوب راندن/ زدن:** *[کنایی]* هەموو بە یەکجۆر لێخوڕین؛ خراپ دادوەری

کردن و له نێواندا جیاوازی دانەنان ‹توی اداره هم کارمند خوب هست هم بد، نباید همه را به یک چوب راند: له مەزرینگەدا هەم کارمەندی چاک هەیە هەم خراپ، نابێ هەموو بە یەکجۆر لێخوڕی›.

**چوبالف** / čûb'alef ، ـها: [فارسی/ عربی]/اسم. شوولک؛ پەیکان؛ پێکان؛ چێویلکەی پێشان دانی پیت یان وشەی نووسراو بۆ نۆمسان یان خوێندنەوەی شتێک لە لایەن نۆ ئامۆژانەوە.

**چوببری** / čûb.borî ، ـها:/اسم. دارتاشخانە؛ چێوبڕی؛ کارگەیەک کە چێوی تێدا دەبڕن و بە شێوەی ئالۆدار و تەژە یان تەختەی درێژ و کوڵ دەری دێنن.

**چوببست** / čûb.bast ، ـها:/اسم. چێوبەس؛ چێوبەست؛ چێوبەن: ١. داربەست؛ پێکهاتەیەک لە مێڵەی ئەستوونی و ئاسۆیی پێکهەڵبەستراو بۆ دانانی تیکەگەلی خانوو (وەک میچ، دیوار، درگا و پەنجەرە) لە سەریەوە ٢. تیرەک؛ ئاوەها قەوارەیەک بۆ بەرگری کردن لە ڕووخان یا خراپی خانووی ئارۆفتە ‹برای جلوگیری از فروریختن ساختمان، همه جایش را چوب‌بست زده بودند: بۆ بەرگری لە ڕووخانی خانووەکە، هەموو لایەکیان چێوبەست کردبوو› ٣. داربەس ‹نقاش از چوب‌بست افتاد و پایش شکست: نەقاشەکە لە چێوبەستەکەوە کەوتە خوارەوە و پێی شکا›.

**چوببغل** / čûb.baqal ، ـها:/اسم. دارشەق؛ چێوشەق؛ چێوشەقە؛ دارهەنگڵ؛ داری بن باڵی پا شکاو یان ئەوانەی پێیان گەزەنی دیوە ‹آرام هنوز با چوب‌بغل راه می‌رود: ئارام هێشتا بە چێوشەقەوە دەڕوا بە ڕێوە›.

**چوببلال** / čûb.balāl ، ـها:/اسم. قۆڵ؛ نێرگتەی چێوینی گەنمەشامی کە دەنکەکانی تێ‌چەقیوە.

**چوبپا** / čûbpā ، ـها:/اسم. چەکمەسوورە؛ دوو داری درێژ بە جێگە پێوە بۆ ڕاوەستان، کە منداڵان یان یاریکەرانی سیرک لە سەریانەوە دەوەستن و پێوە دەچن بەڕێوە.

**چوبپرده** / čûbparde ، ـها:/اسم. چێوپەردە؛ مێڵ‌پەردە.

**چوبپنبه** / čûbpambe, -panbe ، ـها:/اسم. هەودەل؛ تەپەدوور؛ تەپەدۆر؛ چێوپەمە: ١. تۆکڵەی بڕێ داری وەک بەڕوو کە پاش وشک بوونەوە، نەرم و پیف دەبنەوە و سووک و کون‌ـکون هەڵدەگەڕن ٢. تیکەیەک لەو چێوە کە بۆ سەرگرتنی بوتری دەبێ.

**چوبپنبهای** / čûbpambe'î, -panbe'î/: صفت. چێوپەمەیی؛ هەودەلی؛ تەپەدۆری؛ لە چێو پەمە.

**چوبپنبهکش** / čûbpambekeš, -panbekeš ، ـها:/اسم. چێوپەمەکێش؛ کەرەسەیەک بۆ هەڵکێشان و دەرهێنانی چێوپەمەی دەرگای بوتری.

**چوبخط** / čûbxat ، ـها: [فارسی/ عربی]/اسم. [قدیمی] کرت؛ لەلە؛ چێولەلە؛ چێوێکی باریکەڵە کە کاسبکارانی نەخۆنەوار بەکێشان یان هەڵکەندنی هێڵ و نیشانەگەلێک بە سەریەوە، حیسابی قەرزدارانیان تۆمار دەکرد.

⊡ **چوبخط کسی پر شدن**: [کنایی] جێ قەرز کردن بۆ کەسێک نەمان ‹آزاد از بس قرض گرفته چوبخطش پر شده: ئازاد ئەوەندەی قەرز کردووە، جێ قەرز کردنی بۆ نەماوە›.

**چوبدار** / čûbdār ، ـها؛ ـان:/اسم. چۆدار؛ چێوار؛ جەڵەبچی؛ بزگیر؛ جەلاو؛ جەڵەبکڕ؛ کەسێ کە مالات دەکڕێ و دەیفرۆشێتەوە.

**چوبدست** / čûbdast/ ☜ **چوبدستی**

**چوبدستی** / čûbdastî ، ـها:/اسم. چێو؛ چوو؛ چوە؛ چۆڤ؛ داردەس؛ داردەست؛ دارعەسا؛ کەواز؛ چێوتەیاخ؛ شمڕ؛ نەڤیزە؛ گاڕام؛ چوودەس؛ گاڕان؛ چێوێ کە بۆ نێو ڕان و لێخوڕینی ئاژەڵ یان وەک چەک و تەرک بە

دەستەوە دەگیردرێ: **چوبدست**

**چوبرختی** / čûbraxtî ، ـها/:/اسم. چاکلا؛ چێولیباسی؛ ئامرازێکی چێوی یان ئاسنینە بۆ پێوە هەڵواسینی جل و بەرگ ‹پیراهنت را اتو کردم، آویزان کردم به چوبرختی: کراسەکەتم ئوتوو کرد و هەڵمواسیە چاکلاکەوە›.

**چوب سیگاری** / čûbsîgārî/: [فارسی/ فرانسوی] ☜ **چوب سیگار**

**چوبفرش** / čûbfarš ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. ١. تەختەفەرش؛ چێوکوت؛ چێوپۆش؛ ژوورێک کە بەتیکە-تیکەی تەختە یان چێو داپۆشراوە ٢. پارکێت؛ چێوی پارچە-پارچەی ڕێک و لووس‌کراو بۆ داپۆشینی ژوورێک بەجێ موکێت.

**چوبفروشی** / čûbfurûšî ، ـها/:/اسم. چێوفرۆشی؛ دارفرۆشی؛ دامەزراوەی فرۆشی دار و ئاڵۆدار. هەروەها: **چوبفروش**

**چوب‌فلک** / čûbfalak/: [فارسی/ عربی] ☜ **فلک-٣**

**چوبک** / čûbak ، ـها/:/اسم. ئەسپۆن؛ سپۆن؛ حوژە؛ زروێ؛ زرۆی؛ زرۆ؛ یەوشە؛ سەونچک؛ هلۆت؛ هیلۆ؛ پووشە نەورۆزە؛ پووش عەنتەرە؛ کەفکەفۆگ؛ کەفکەفۆک؛ گیاکەفە؛ چۆخان؛ چەوغان؛ دڕکەئاڵەت؛ گیایەکە جاران بە پنج و ڕەگەکەی شتیان دەشۆرد: **چوبه -٢**

**چوبکاری** / čûbkārî/:/اسم. چێوکاری: ١. کارکردن بە چێو بەتایبەت کارگەلی ڕازێنەیی و جوانکاری ٢. چێوکوتان؛ ژەندن یان لێدانی پەیتاپەیتا بە چێو ٣. *[مجازی]* جولانەوەی بە میهرەبانی و لێبوردوویییەوە لە حاندی کەسێک کە لە بەر چاوەڕوان نەکراوی ببێتە هۆی خەجاڵەتباری ئەو کەسە.

**چوب‌لباسی** / čûblebāsî ، ـها/: [فارسی/ عربی] /اسم. چێولیباسی؛ چاکلا؛ ئامرازێکی چێوی یان ئاسنینە بۆ پێوە هەڵواسینی جل و بەرگ.

**چوبه** / čûbe ، ـها/:/اسم. ١. دار؛ کۆڵەکە یان لادارێ کە بە زەویاندا چەقاندبێ ‹چوبەی اعدام: دار قەواخ› ٢. ☜ **چوبک** ٣. *[قدیمی]* تیر؛ ئەوەی بە کەوان دەیهاوێن.

▣ **چوبەی اعدام:** دار قولاخ؛ دارقەواخ؛ دارێ کە تاوانکاری بۆ کوشتن پێوە دەبەستن.

**چوبەی دار:** داری قەنارە؛ سێدارە؛ کۆڵەکەیێ بە تیرەکێکی ئاسۆیی، بۆ هەڵواسین و خنکاندنی تاوانبار.

**چوبی** / čûbî/: صفت. چێوی؛ چێوین: ١. چوویی؛ چۆڤی؛ پێوەندیدار یان سەر بە چێو ‹بافت چوبی: بافتی چێوی› ٢. دارین؛ چێ‌کراو لە چێو ‹در چوبی: دەرگای چێوی›.

**چوبین** / čûbîn/: صفت.*[ادبی]* چێوی؛ چێوین؛ چووینە؛ دارینە؛ دارین؛ تایبەتمەندی هەر شتێ کە لە دار دروست بووبێ ‹پای چوبین سخت بی‌تمکین بود: پای چێوی زۆر لەرزۆکە›.

**چوپان** / čûpān ، ـها؛ ـان/:/اسم. شوان؛ شوانە؛ شڤان؛ شیڤان؛ چوپوو؛ گەلەوان؛ ڕانەوانێ کە ئاژەڵ دەلەوەڕێنێ و چاودێرییان لێوە دەکا (بەتایبەت کەسێ کە بە وەرگرتنی مز، ئەو کارە دەکا).

**چوپانی** / čûpānî/:/اسم. شوانی؛ شوانەیی؛ شڤانی؛ ڕامیاری؛ شەوونی؛ شوانێتی؛ کار یان کردەوەی شوان.

**چوپی** / čûpî/: [کردی]/اسم. هەڵپەڕکێ؛ دیلانە؛ دیلانێ؛ گۆبەند؛ جۆرێ لەیزی بە کۆمەڵ.

**چوچوله** / čučule/:/اسم. بەلۆکە؛ بەلووکە؛ بەلوو؛ قیتکە؛ قیتک؛ قیچک؛ نیچک؛ چیلکە؛ میتک؛ میتۆڵ؛ میتۆلە؛ میتکە؛ گلک؛ گولنک؛ چوچەلە؛ پەلە؛ نێوەر؛ کوڕکە؛ دوو پەلە گۆشتی لای سەرووی ئەندامی زاوزێی گوانداری مێ.

**چوخا** / čowxā, čo:xā ، ـها/: [از کردی]/اسم. چوخک؛ چۆغە؛ چۆخە؛ چۆخی؛ پەستە؛ پەسەک؛ چۆغک؛ سەرکەوای لە بووزوو.

**چوگان** / čowgān, čo:gān/: *اسم.* ١. شاقوبانی؛ شاقۆلانێ؛ حەچان؛ شەقێن؛ گۆیێن؛ گۆبازی؛ کاشۆبازی؛ هۆکی؛ گەمەی گۆ و گۆچان؛ وەرزشێکی گرووپی، یاریکەرانی لە سەر ئەسپ بە گۆچان لە گۆی دەدەن تا بچێتە نێو دەروازەوە ٢. /ـها/ گۆچان؛ شاکۆن؛ شاقۆڵ؛ قاشۆ؛ حەچ؛ شەق؛ کاشۆ؛ باکوورە؛ شەک؛ شەق؛ گۆپاڵ؛ گالۆک؛ هۆلی؛ تۆپتاو؛ گورەچەنگ؛ چێوێکی سەر چەوێلە گۆی پێ دەخەن.

**چون**[1] / čûn/: *قید. [ادبی]* چۆن؛ چوون؛ چەین؛ چلۆن ‹روزگار تو چون بود؟: حاڵ و باڵی تۆ چۆن بوو؟›.

**چون**[2]: *حرف.* ١. لەبەر ئەوە؛ بەو بۆنەوە؛ بۆ ئەوەی؛ چوون؛ چوونکا؛ چوونکە؛ چۆنکاتێ؛ چونکاوەکوو ‹چون هوا تاریک بود، چراغ روشن کردم: لەبەر ئەوەی هەوا تاریک بوو چرام هەڵکرد› ٢. *[ادبی]* وەک؛ وەکی؛ وێنە؛ هەر وەک؛ وەکوو؛ وەو؛ پیسە؛ هەر پێسەو؛ کفت؛ کفتی؛ عەین؛ دەردی؛ عەین‌وەمەین؛ کوت‌ومت؛ چەشنی ‹چون برق: وەک کارەبا› ٣. *[ادبی]* کە؛ گاڤاکە؛ لە کاتێکدا؛ کاتێ کە؛ وەختاریوە؛ وەختارێ؛ ئەگەر ‹چون شب شد چراغ آوردند: کە شەو داهات چرایان هێنا›.

**چون و چرا** / čûn-o-čerā ، ـها/: *اسم.* سێ‌ودوو؛ قسە و باس؛ چۆن و چلۆن؛ ئەمەکە و ئەوەکە؛ چۆن و بۆ؛ پرسیار لە هۆ و چۆناوچۆنی ‹گفت: دستورات را باید بدون چون و چرا اجرا کنی: گوتی: دەبێ فەرمانەکان بە بێ سێ‌ودوو بەرێوە بەری›.

**چونی** / čûnî/: *اسم. [ادبی]* چۆنیەتی؛ چۆنی؛ چۆناوچۆنی؛ چۆنایەتی؛ لە چ دۆخ و ژیوارێکدا بوون.

**چه**[1] / če/: *صفت.* چ: ١. /ـها/ چە؛ چی؛ چێش؛ چوە؛ بۆ پرسیارکردن لە چۆناوچۆنی شتێ ‹شام چه داریم؟: شێو چمان هەیە؟› ٢. بە چۆنیەتی نائاسایی (خراپ، باش، درێژ، کورت ...) ‹چه مردی!؛ چه بویی!: چ پیاوێک!؛ چ بۆنێ!›.

**چه**[2]: *قید.* چ؛ چە؛ چەنێ؛ چەند؛ چەنێک؛ چن؛ چندە؛ چنە؛ چننە؛ زۆر- زۆر؛ یەکجار فرە ‹چه کیفی کردم: چ کەیفێکم کرد›.

**چه**[3]: *ضمیر.* چی؛ چە؛ چێش؛ چ؛ چوە: ١. نیشانەی پرسیاری و بە واتای: *الف)* چ شتێ ‹چه خریدی؟: چیت سەند؟› *ب)* چ کارێ ‹چه کرد؟: چی کرد؟› ٢. شتاق؛ هیچ شت یا هیچ کار ‹چه داشتم بدهم؟: چیم بوو بیدەم؟› واتا: شتێکم نەبوو بیدەم.

**چه**[4]: *حرف.* ١. چ؛ چە؛ نیشانەی هاوسانی و بەرانبەری دوو شت، کەس یان بار و دۆخێک ‹چه این، چه آن، چه ببرد، چه ببازد: چ ئەمە، چ ئەوە، چ بباتەوە، چ بدۆڕێنێ› واتا: هەردووک بار وەکوو یەک وایە ٢. *[ادبی]* چوونکا؛ چونکاتێ؛ چونکە؛ چوونکەی؛ چوونگ ‹باید می‌رفتیم، چه داشت دیر می‌شد: دەبوا بڕۆیشتباین، چونکە خەریک بوو وە درەنگ دەکەوتین› ٣. چ؛ چە؛ هەم ‹ما می‌دانستیم، چه من، چه مادرم: ئێمە دەمانزانی، چ من، چ دایکم› ٤. چه لە؛ چ لە؛ چە؛ چ؛ هەر وەک؛ هەر لە؛ هەر جە ‹همه چیز داشتند، چه پول، چه لباس: هەموو شتێکیان هەبوو، چە لە پارە، چ لە جل›.

**ـچه**[5]: *پسوند.* ـ چک؛ ـ چە؛ ـ لە؛ ـ کەلە؛ ـ یلە؛ ـ وولە؛ ـ یچک؛ ـلە؛ ـچەک؛ ـ ژە؛ ـ یلکە؛ ـ یچە؛ پاشگری چکۆلە کردنەوە ‹درختچه؛ آلوچه: دارچک؛ هەڵووچە›.

**چها** / čehā/: *ضمیر.* چی؛ چە؛ چێش؛ چ شتگەلێ؛ هێما بە شتگەلێک بە چۆنیەتی تایبەتەوە (خراپ، چاک و سەیر و...) کە زۆرتر بۆ کەسێ کە رووی قسەی لێیە، چییەتیەکەی دیارە ‹نمی‌دانی چها کشیدم!: نازانی چیم کێشاوە!›.

**چهار**[1] / čahār/: *اسم.* چوار؛ چار؛ یەک و سێ؛ ژمارەی سەرەکی نێوان سێ و پێنج ‹بعد از سه نوبت می‌رسد به چهار: دوای سێ نۆرەی چوارە›.

**چهار**[2]: *صفت.* چوار؛ چار: ١. دانێ زۆرتر لە سێ

دانه ‹چهار مرد: چوار پیاو› ٢. چوارم؛ چوارەم ‹شمارەی چهار: ژمارەی چوار›.

**چهار-**[3]: *پیشوازە.* چوار-؛ بە چوار ژمارە لە شتێ ‹چهاردیواری؛ چهارساله: چواردیواری؛ چوارسالان›.

**چهارابرو** / čahār'abrû/: *صفت.* برۆپان؛ برۆ پان‌وپڕ؛ برۆ گژکن.

**چهاراسبه** / čahār'asbe/: *قید.[کنایی]* بەتاو؛ چوارناڵ/ ناڵە؛ بە خار؛ بە غار؛ تەقڵەکوت؛ چوارە؛ بەتاڵووکەیەکی زۆرەوە ‹چهاراسبه در مسیر ترقی می‌تاخت: بەتاو لە ڕێبازی سەرکەوتندا غاری دەدا›.

**چهاربر** / čahārbar/ ☜ **چهارضلعی**

**چهاربعدی** / čahārbo'dî ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* چوار لایەنی؛ چوار لایی؛ خاوەن چوار ڕەهەندی درێژایی، پانایی، بەرزایی و کات.

**چهاربند** / čahārband/: *اسم.* چواربەندە؛ هەر دوو ئانیشک و هەر دوو ئەژنۆ؛ برێتی لە هەموو بەندی لەش.

**چهارپا** / čahārpā ، ـها؛ ـیان/: *اسم.* چاروا؛ چارەوێ؛ چوارپێ؛ چوارپا؛ چوارڤا؛ هەر کام لە گیانەوەرانی گوهاندار کە لە سەر دوو دەست و دوو پێوە بەڕێوە دەچن، بەتایبەت گواندارانی ماڵی کە بۆ سواری و بارلێنان ڕادەگیرێن (وەک ئەسپ و کەر و هێستر).

**چهارپاره** / čahārpāre ، ـها/: *اسم.* چوارپارە؛ چوارکوتە؛ چوارتیکە؛ جۆرێ گوللەی تفەنگی ساچمەیە کە لە جێ زۆرێک ساچمەی ورد، چوار- پێنج ساچمەی گەورەی تێ دەخەن بۆ نەچیری گەورە.

**چهارپایه** / čahārpāye ، ـها/: *اسم.* تەپلەک؛ چوارپایە؛ چوارپاچکە؛ چتی؛ جۆرێ سەندەڵی بێ پشتی و دەستە.

**چهارتاق**[1] / čahārtāq/: [فارسی/ معرب] *اسم.* بەنایەک کە لە سەر چوار پایە و چوارکەوانەوە بە شێوەی گومبەز دروست دەکرێ: **چهارطاق**

**چهارتاق**[2]: *صفت.* تاک-تاک؛ تاک؛ تاق؛ تەواو ئاوەلا (بۆ دەرگا و دەلاقە دەگوترێ) ‹درها را چهارتاق باز گذاشته بودند: دەرگاکانیان تاک-تاک بە جێ هێشتبوو›: **چهارطاق**

**چهارتخم** / čahārtoxm/: *اسم.* چوار توخمە؛ تێکەڵێک لە تۆمگەلی وەردێنە، ڕکێشە و ناوکە بەهێ و سیپیسوو، کە دەم کراوەکەی بۆ سارێژی قۆزە و نەرم کردنەوەی سینگ باشە.

**چهارجهت** / čahārcahat/: [فارسی/ عربی] *اسم.* چوارلا؛ چوارنکال؛ چوار کەناران؛ چوار بەرەوگەی سەرەکی کە لە ڕاستای باکوور و باشوور و ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادایە.

**چهارچرخه** / čahārčarxe ، ـها/: *اسم.* چوارچەرخ؛ چوارتەگەرە: ١. چوارقول؛ جۆرێ گاری ئەسپی کە چوار تەگەرەی هەیە ٢. *[کنایی]* هەر چەشنە کەرەسەی گواستنەوە بە چوار چەرخەوە، بەتایبەت ترۆمبیل.

**چهارچشمی** / čahārčešmî/: *قید.[مجازی]* بە وردی؛ چوارچەوی؛ بە دیققەت ‹چهارچشمی مواظبش بود: بە وردی هۆشی پێوە بوو›.

**چهارچوب** / čahārčûb ، ـها/: *اسم.* چوارچێوە؛ چارچێوە؛ چوارچۆ: ١. باڵشمە؛ چارچم؛ دۆر بەند؛ چوار لاسکی پێکەوە بەسراوی وەک چوارگۆشێکی ناو بۆش کە شتێک لە ناو خۆدا ڕادەگرێ ‹چهارچوب پنجره: چوارچێوەی ستاتی› ٢. کەوشەن؛ سنوور؛ پەرێز ‹باید در چهارچوب قانون عمل کرد: دەبێ لە چوارچێوەی قانووندا تێکۆشی› ٣. دوزەنە؛ مرێس ‹کار باید چهارچوب داشته باشد: کار دەبێ چوارچێوەی هەبێ› ❋ **چارچوب**

**چهارخانه** / čahārxāne ، ـها/: *صفت.* چوارخانە؛ شەترەنجی ‹صفحه‌ی چهارخانه: ڕووپەڕی چوارخانە›.

**چهاردست و پا** / čahārdast-o-pā/: *قید.[گفتاری]* چوارپەل؛ چواردەس و پا؛ چوارپاچکە؛ چوار چەقەڵ؛ گامووڵە؛ لە سەر دوو دەست و

دوو پا ‹چهاردست و پا راه می‌رفت: چواره‌پەل به ڕێگادا دەڕۆیشت›.

**چهارده**[1] / čahārdah/: *اسم.* چارده؛ چوارده؛ ژمارەی بنەمایی نێوان سێزده و پازده.

**چهارده**[2]: *صفت.* چارده؛ چوارده: ۱. دانه‌یه‌ک زیاتر له سێزده دانه ۲. چوارده‌هه‌م؛ چوارده‌یه‌م.

**چهاردهم** / čahārdahom/: *صفت.* چوارده‌هه‌م؛ به ڕیز یان پله‌ی چوارده‌وه.

**چهاردهمی** / čahārdahomî/: *ضمیر.* چوارده‌هه‌می؛ چوارده‌می؛ چارده‌می؛ ئه‌وی که له ڕیز یان پله‌ی چوارده‌هه‌مدا بێت.

**چهاردهمین** / čahārdahomîn/: *صفت.* چوارده‌مین؛ چارده‌مین؛ چوارده‌هه‌مین، به ڕیزمان، پله یان جێگای چوارده‌هه‌مه‌وه.

**چهاردیواری** / čahārdîvārî ، ـ هـا/: *اسم.* چواردیواری: ۱. شوێنی دەورگیراو ‹یک چهاردیواری لازم داشت که شب گله را توی آن جا بدهد: چواردیواریه‌کی پێویست بوو که به شەو ڕانه‌که‌ی تێدا مۆڵ بدا› ۲. *[مجازی]* جێگای پاوان؛ قۆرخ ‹پدرم ما را در چهاردیواری منزل آزاد گذاشته بود: بابم له چواردیواری ماڵه‌وه ئازادی هێشتبووین› ۳. *[کنایی]* ماڵ؛ خانوو؛ یانه ‹چهاردیواری اختیاری: ماڵی خۆمه و ڕای به خۆمه›.

▣ **چهاردیواری اختیاری:** هه‌رکه‌س پاشای ماڵی خۆیه؛ ماڵی خۆمه و ڕای به خۆمه؛ هه‌ر که‌س له ماڵه خۆ ئازاده.

**چهارراه** / čahār.rāh ، ـ هـا/: *اسم.* چوارڕێیان؛ چوارڕیان؛ چوارڕێ؛ چوارڕا؛ چوارڕێگان؛ چارڕێک: ۱. جێگه‌یه‌ک که دوو ڕێگا یه‌کتر ده‌بڕن ۲. جێگایه‌ک که تێیدا چوار ڕێگه له چوار لای جۆراوجۆره‌وه به یه‌ک ده‌گه‌ن.

**چهارزانو** / čahārzānû/: *اسم.* چوارمه‌شقی؛ چوارمه‌شقه؛ چوارمه‌شقان؛ چوارچمکی؛ چوارمێرکی؛ چوارمێکه؛ چوارمێرده‌کی؛ مێهڤانیک؛ دۆخ یان حاڵه‌تی دانیشتن که هه‌ر کام له پاژنه‌کان له ژێر ڕانی پای‌تردا بێ.

**چهارسو** / čahārsû/: *اسم.* ۱. چوارلا؛ چوارسۆ؛ چواربه‌ره‌وگه (سه‌ر، خوار، چه‌پ، ڕاست) ۲. ـ هـا/ *[قدیمی]* چوارگوزه‌ر؛ ژێرتاقێک له بازاڕدا که چوار گوزه‌ری لێ جوێ ده‌بێته‌وه: **چهارسوق** ۳. ـ هـا/ چوارسۆ؛ چوارلا؛ جۆرێ پێچ‌گوشتی.

**چهارسوق** / čahārsûq/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* ۱. *[مجازی]* دنیا؛ ئه‌م جیهانی جێ هاتن و چوونه ۲. *[قدیمی]* ☜ **چهارسو ـ ۲**

**چهارشاخ** / čahāršāx ، ـ هـا/: *اسم.* *[کشاورزی]* شه‌ن؛ شه‌نه؛ شه‌نێ؛ ملێب؛ ملهێب؛ ته‌بور؛ ئامرازێ که له وه‌رزێریدا بۆ جێبه‌جێ کردنی گیا و شه‌ن‌کردن و کارگه‌لێ وا ده‌بێ.

▣ **چهارشاخ ماندن:** *[مجازی]* ماق مان؛ وشک بوون؛ واق وڕمان ‹از تعجب چهارشاخ مانده بود: له به‌ر سه‌رسووڕماوی ماق مابوو›.

**چهارشانه** / čahāršāne/: *صفت.* چوارشانه؛ بله‌ر؛ خاوه‌نی شانی پان و سنگی ئه‌ستوور و پته‌و ‹یک آقای بلند قد و چهارشانه آمده بود: پیاوێکی بالابه‌رز و چوارشانه هاتبوو›.

**چهارشنبه** / čahāršambe, -šanbe ، ـ هـا/: [فارسی/ آرامی]/*اسم.* چوارشه‌ممه؛ چوارشه‌م؛ چوارشه‌مۆ؛ چوارشه‌مبۆ؛ چوارشه‌مبێ؛ چارشه‌مب؛ چارشه‌م؛ ناوی ڕۆژی پێنجه‌م له حه‌وتووی ئێرانیدا، نێوان سێ‌شه‌ممه و پێنج‌شه‌ممه.

**چهارشنبه‌سوری** / čahāršambesûrî, -šanbesûrî، ـ هـا/: [فارسی/ آرامی/ فارسی]/*اسم.* چوارشه‌ممه‌سووری؛ چوارشه‌ممه کوله؛ کوله چوارشه‌مۆ؛ قوله چوارشه‌مه؛ چوارشه‌ممه که‌ڵه؛ ئاخرین شه‌وچوارشه‌ممه‌ی ساڵ.

**چهارشنبه‌شب** / čahāršambešab, -šanbešab ، ـ هـا/: [فارسی/ آرامی/ فارسی]/*اسم.* شه‌وی پێنج‌شه‌ممه؛ شه‌و په‌نشه‌مه؛ شه‌وی دوای ڕۆژی چوارشه‌ممه؛ شه‌وی چوارشه‌ممه له سه‌ر پێنج‌شه‌ممه.

**چهارصد**[1] / čahārsad/: *اسم.* چوارسەد؛ ژمارەی سەرەکی نێوان سێسەد و نەوەد و نۆ و چوارسەد و یەک؛ چوار بەرانبەری سەد.

**چهارصد**[2]: *صفت.* چوارسەد: ١. دانەیەک زیاتر لە سێسەد و نەود و نۆ دانە ٢. چوارسەدەم؛ چوارسەدەم.

**چهارصدم** / čahārsadom/: *صفت.* چوارسەدەم؛ چوارسەدەم؛ بە ڕیزمان یان پلە و جێگای چوارسەدەوە.

**چهارصدمی** / čahārsadomî/: *ضمیر.* چوارسەدمی؛ چوارسەدەمی؛ ئەوەی لە ڕیز، پلە یان جێگای چوارسەدەمدایە.

**چهارصدمین** / čahārsadomîn/: *صفت.* چوارسەدەمین؛ بە ڕیزمان یان پێگەی چوارسەدەمەوە.

**چهارضرب** / čahārzarb/: [فارسی/ عربی] *اسم.* لە کێشەکانی مووسیقا کە بە شێوەی چوار ڕەش دەنووسرێت.

**چهارضلعی** / čahārzel'î ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* چواربەر؛ چوارگۆشە؛ بیچمی هەندەسی بەسراو کە چوار بەر و چوار سووچی هەیە. هەروەها: **چهاربر**

**چهارطاق** / čahārtāq/: [فارسی/ معرب] ☜ **چهارتاق**

**چهار عمل اصلی** / čahār'amale'aslî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* *[ریاضی]* چوار کاری سەرەکی ژمێردن (کۆکردنەوە، کەمکردنەوە، لێکدان و بەشکردن).

**چهارفصل**[1] / čahārfasl/: [فارسی/ عربی] *اسم.* چواروەرز؛ چوار کژی ساڵ کە بریتین لە بەهار، هاوین، پاییز و زستان.

**چهارفصل**[2]: *صفت.* چواروەرزە؛ چوارکژە؛ لەبار بۆ کەڵکوەرگرتن لە هەموو وەرزەکان ‹این پیراهن چهارفصل است: ئەم کراسە چواروەرزەیە›.

**چهارگاه** / čahārgāh/: *اسم.* چوارگا؛ یەکێ لە حەوت دەزگای مووسیقای ئێرانی.

**چهارگل** / čahārgol/: *اسم.* چوارگوڵ؛ دەرمانی گیایی بریتی لە وەنەوشە، گوڵی تۆڵەکە (پەپەچەورە) و گوڵە لەولاو کە دەم کراوەکەی ڕەوانە.

**چهارگوش** / čahārgûš ، ـها/: *اسم.* ١. چوارگۆشە؛ چوارچمک؛ چوارسووک؛ چوارقولینچک ٢. لاکێشە؛ درێژکۆڵە؛ بیچمی هەندەسی تەخت و چواربەر کە هەر دوو بەری بە قەد یەک و لە بەرامبەر یەکەوەن.

**چهارلاچنگ** / čahārlāčang/: *اسم.* *[موسیقی]* یەکەی کات لە نوت نووسیدا کە درێژەی دەکاتە یەکهەشتەمی چەنگ.

**چهارم** / čahārom/: *صفت.* چوارم؛ چوارەم؛ چارم؛ چارەم؛ بە ڕیز، پلە یان پێگەی چوارەوە.

**چهارمضراب** / čahārmezrāb ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* چەهار میزراب؛ بەشێکی زەربی لە دەسپێک یان بەیناوبەینی دوو بەشی ئاوازی لە مووسیقی ئێرانیدایە.

**چهارمی** / čahāromî ، ـها/: *ضمیر.* چوارەمی؛ چارمی؛ ئەوی لە ڕیز، پلە یان پێگەی چوارمە.

**چهارمیخ** / čahārmîx/ ☜ **چارمیخ ـ ١**

**چهارمیخه** / čahārmîx/: *اسم.* ئەشکێل؛ ئشکێل؛ چوارمیخە؛ چوارنیخە.

**چهارمین** / čahāromîn/: *صفت.* چوارەمین؛ چارەمین؛ بە پلە، ڕیز یان پێگەی چوارەمەوە.

**چهارنعل** / čahārna'l/: [فارسی/ عربی] *اسم.* غار؛ پرتاف؛ پرتاو؛ ترەختان؛ چوارناڵە؛ چارگاقی؛ چوارە؛ لنگکوت؛ ڕۆیشتنی بە خێرای ئەسپ.

⊡ **چهارنعل رفتن**: بە غار ڕۆیشتن؛ بە پرتاو ڕۆیشتن؛ بە چوارناڵ چوون؛ زۆر بە خێرایی ڕۆیشتن. هەروەها: **چهارنعل تاختن**

**چهاریک** / čahāryek/: *اسم.* چواریەک؛ بەشێ لە چوار بەشی یەکسان.

**چهچه** / čahčah ، ـها/: *صوت.* چریکە؛

چەهچەهە؛ ئاوازی باڵندەی دەنگ خۆش.

◘ **چهچـــه زدن:** چریکانـــدن؛ چریکـــەکردن: ۱. خوێندنی بولبول و پەلەوەرانی دیکە ‹بلبل توی قفس چهچه میزد: بولبولەکە لە نێـو قەفەسـدا دەیچریکانـد› ۲. چەهچەهـە لێـدان ‹خواننده داشت چهچه میزد: گۆرانیبێژەکە دەیچریکاند›.

**چهچهه** / čahčahe ، ـها/: *صوت. [ادبی]* چریکـە؛ ئاوازی باڵندەی دەنگ خۆش.

**چهره** / čehre ، ـها/: *اسم. [ادبی]* ۱. دەم و چـاو؛ ڕوومـــەت؛ ڕوخـــسار؛ ڕوو؛ ڕوی؛ ڕوە؛ ڕواڵـــەت؛ دیمەن؛ چڕ؛ دیم؛ دەفک؛ ڕووچک؛ ڕووک؛ چێڕ؛ چتر؛ چیەر؛ بیچم؛ چار؛ بەشی پێشووی سـەری مرۆ کە بریتیە لە هەنیە، گۆنا، چاو، برۆ، دەم، لێو و چەنە ۲. *[مجازی]* دیم؛ دیمـەن ‹چهـرەی هـزار: دیمـی هـەزار› ۳. سیما؛ چەهرە؛ چـار؛ ڕواڵـەت؛ ڕاپۆرت یـان لێکدانەوەیـەک کـە دەبێتـە هـۆی ناسینی شتێ ‹چهرەی سیاسی دوران جنگ: سـیمای ڕامیاری سەردەمی شەڕ› ٤. *[مجازی]* کەس؛ تاک؛ کەسایەتی ‹او چهرەی مشهوری شده بود: ئـەو ببـووە کەسـێکی نـاودار› ٥. دیم؛ دیمـــەن؛ تەشـــک؛ ڕواڵـــەت؛ کەسـێک بـە تایبەتمەنـدی کـاری وئاکـاری بـەرچاو و ئاشـکراوە ‹چهـرەی محبـوب: دیمەنـی خۆشەویست›.

◘ **چهرەی باز:** ۱. خۆشـحاڵ؛ لـە سـەر کـەیف؛ کەیف خۆش؛ شاد؛ نـاو چـاو کـراوە ۲. ڕووی گەشاوە ‹با چهرەی باز از من استقبال کرد: بە ڕووی گەشاوە هاتە پێشوازیمەوە›.

**چهرەی برافروخته:** ڕووی هەڵگرسـاو؛ سـوور هەڵگەڕاو؛ دەم و چاوێک کە بە هۆی تین و تا، تووڕەیی یان یاوەوە سوور هەڵگەڕاوە.

◘ **چهره شدن:** *[مجازی]* بەناوبانگ بوون؛ نـاو دەر کردن؛ دەرەوشانەوە. هەروەها: **چهره کردن**

**چهـره آرا** / čehre'ārā ، ـیان/: *اسم.* ڕوومـەتکار؛ دیمکار؛ دیمڕازێن؛ گریمـور؛ کەسـێ کـە کـاری ڕوومەتکاریە.

**چهره آرایی** / čehre'ārāyî/: *اسم.* ڕوومـەتکاری؛ دیمکاری؛ کـار یـان ڕەوتی دەسـت وەردان لـە ڕوومەتی کەسێ بە مەبەستی گۆڕانی دیمـەن و دەرهێنانی بە شێوازی دڵخواز.

**چهرەای** [1] / čehre'î/: *اسم.* ۱. چێرەیـی؛ گوڵـی؛ پەمـەیی؛ ڕەنگـی سـووری ئـاڵ ۲. سوورسـنج؛ سوور و سـپی؛ بـەفر و خـوێن؛ ڕەنگـی پێـستی جوان و پاراو.

**چهرەای** [2]: *صفت.* چێرەیی؛ ئاماڵ سوور و سـپی؛ پەمەیی؛ بە ڕەنگی چێرەیی.

**چهـرەپـرداز** / čehrepardāz ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ۱. دیمـــەنکێش؛ چـــارەکێش؛ ڕوخـــسارکێش ۲. دیمەنکار؛ دیمکـار؛ گریمـۆر ۳. کەسـێ کـە بەجوانی، خـدە و ئاکـاری کەسـانی جۆراوجـۆر دەردەبڕێ. هەروەها: **چهرەپردازی**

**چهرەخانـه** / čehrexāne ، ـهـا/: *اسم. [نامتـداول]* ژووری گـــریم؛ ژوورێ کـــە دیمـــەنکاری تێـــدا دەکرێت.

**چهـــرەنگـــار** / čehrenegār ، ـهـا؛ ـان/: *اسـم.* دیمەنکێش؛ شێوەکێش؛ نیگارکێش؛ کەسێ کـە وێنەی کەسانی دیکە دەکێشێت.

**چهل** [1] / čehel/: *اسم.* چـل؛ ژمـارەری سـەرەکی پاش سی و نۆ و پێش چل و یەک.

**چهل** [2]: *صفت.* چل: ۱. یەکێ زۆرتر لە سی و نـۆ ۲. چلەم.

**چهل تکه** / čeheltekke ، ـهـا/: *اسم.* چـل تیکـە؛ چل کوت؛ جلک، بەرگ، پێخەف یان هەر جـۆرە کەرەســتەیەکی پارچــەیی کــە لــە تیکەگــەلی بچـووکی پارچـەی جۆراوجـۆر و ڕەنگاوڕەنـگ دووراوە. هەروەها: **چل تکه**

**چهلم** [1] / čehellom/: *اسم. [گفتاری]* چلـە؛ چلـێ: ۱. چلەمین ڕۆژی کۆچی دوایی کەسێ ۲. ڕێ و ڕەسمێ کە بەم بۆنەوە بەڕێوە دەچێـت ‹برایش چهلم گرفتیم: چلەمان بۆی گرت› * **چله**

**چهلم** [2]: *صفت.* چلەم؛ چلەمین؛ بە ڕیز، پلـە یـان

پێگەی چل ‹نفر چهلم کنکور: چلەم کەسی کونکوور›.

**چهلمی** / čehel(l)omî/: ضمیر. چلۆمی؛ چلەمی؛ ئەوی لە ڕیز، پلە یان پێگەی چلەم دایە.

**چهلمین** / čehel(l)omîn/: صفت. چلەمین؛ چلۆمین؛ بە ڕیز، پلە یان پێگەی چلەم.

**چی**[1] / čî/: حرف. [گفتاری] چی؛ چە؛ چێش؛ چ شتێ؛ چە چتێ ‹چی میخواست؟: چی دەویست؟›.

**ـ چی**[2]: [ترکی] پسوند. ـ چی: ١. خاوەن یا بەڕێوەبەری شتێ یان جێگایەک ‹تفنگچی: تفەنگچی› ٢. ـ کەر؛ ـ کر؛ خاوەنی پیشە یان ئەنجامدەری کارێ ‹شکارچی: ڕاوچی› ٣. ـ یی؛ ـ وەی؛ سەر بە جێگایەک (بۆ وشەیەک بە «ه» یا «ی» دوایی بێ) ‹کلکتەچی: کەلکەتەچی› ٤. فرۆشیاری شتێ ‹چایچی: چایچی› ٥. شوێنکەوتوو؛ خوازیار (بۆ ناوێک پیتی ئاخری «ی» دەنگدار بێ) ‹آذریچی: ئازەریچی›.

**چیپس** / čîps ، ـها/: [انگلیسی] اسم. ١. چیپس؛ قاشی ناسکی سێفەزەمینەی سوورەوکراو و برژاو ٢. تراشە؛ پەڕە؛ تاشە؛ تۆلاشە؛ وردە و پرزەی جیاوەبووگ لە هەر شتێک.

**چیت** / čît/: [هندی] اسم. چیت؛ قوماشی ناسک لە بەنی پەموو بە نەخش و نیگاری گوڵ و گیای ڕەنگاوڕەنگ.

**چیتا** / čîtâ ، ـها/: [هندی] اسم. یۆز؛ هاس؛ چیتا؛ تاژپلنگ؛ تولە پلنگ.

**چیتسازی** / čîtsâzî ، ـها/: [هندی/ فارسی] اسم. چیتسازی؛ کارخانەی چیت چێکر.

**چیدن** / čîdan/: مصدر متعدی. // **چیدی**: چنیت؛ **میچینی**: دەچنی؛ **بچین**: بچنە// چنین؛ چنیەی: ١. ڕنینەوە؛ خەرتاندن؛ برین؛ دروین؛ چنینەوە؛ چەنن؛ چنیەیوە؛ هەڵکەندن یان جوێ کردنەوەی ڕوەکان لە لاسکە یان تەنەیان ‹چیدن میوه: چنینی میوه› ٢. دوورین؛ چەنن؛ کەندن؛ برین و هەڵکەندنی گژ و گیا ‹چیدن علف: گیا دوورین› ٣. داچنین؛ چنیەی؛ دانانی شتومەک لە جێگای تایبەتی خۆیان بە پێی گەڵاڵە یان بەرنامەی دابینکراو ‹چیدن سفره: چنینی سفره› ٤. داڕشتن؛ چێکرن؛ گەڵاڵە پێدان یان ڕێک و مرێس کردنی پیلان یان بەرنامەیەک بۆ گەیشتن بە مەبەست ‹نقشه چیدن: پیلان داڕشتن›. هەروەها: **چیدنی**

■ صفت مفعولی: **چیده** (چنراو)/ مصدر منفی: **نچیدن** (نەچنین)

**چیرگی** / čîregî ، ـها/: اسم. زاڵی؛ چێری؛ چیری: ١. دەس بە سەرداگری؛ کار یان ڕەوتی وە ژێر خستنی کەسێ یان شتێک لە ڕێگەی هێز خستنە گەڕەوە ٢. سەرکەوتوویی.

**چیره** / čîre/: صفت. زاڵ؛ چیر؛ چێر: ١. کارامە؛ هەل؛ گورد ‹چیره دست: چیر دەست› ٢. دەس بە سەرداگر ‹چیره شدن تاریکی: زاڵ بوونی تاریکی› ٣. سەرکەوتوو؛ زاڵ ‹چیره شدن بر دشمن: زاڵ بوون بە سەر دوژمندا›.

**چیرەدست** / čîredast/: صفت. [ادبی] وەستا؛ ئوسا؛ مامۆستا؛ مامۆسا؛ کارزان؛ زاڵ؛ توانا؛ کارامە؛ چیرەدەست؛ بە دەستوبرد ‹نقاش چیرەدست: نیگارکێشی وەستا›.

**چیرەدستی** / čîredastî ، ـها/: اسم. وەستایی؛ کارامەیی؛ دەستهەلی؛ چیرەدەستی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بە دەستوبرد بوون.

**چیز** / čîz ، ـها/: اسم. شت؛ چت؛ چشت؛ تشت؛ چێو؛ هن: ١. تەنێکی مادی بێگیان یان بێئاوەز ‹هر چیز: هەر شت؛ یک چیز سفتی خورد به دستم: شتێکی ڕەق دای لە دەستم› ٢. ڕووداو، دیاردە، قسە یان بیر، بە شێوەی گشتی و بێناو بردنی ‹آن چیز که میگفتی چه بود؟: ئەو شتەی دەتگوت چبوو؟› ٣. ماک یان بوونەوەرێ کە جوان نەناسراوە یان ڕاست و ورد باسی نەکراوە ‹چیزهایی در دستش بود: چەن شتێک بە دەستیەوە بوو› ٤. سامان؛

مـاڵ؛ دارایـی ‹دامـاد کـه خـودش هـیچ چیـز نـدارد، مگـر بـرادرش چیـزی بدهـد: زاوا بۆخـۆی چتێکـی نیه، مەگەر براکەی شتێک بدا›.

**چیزبرگر** / čîzberger/: [انگلیسی]/*اسم*. چیزبرگر؛ هەمبەرگر لەگەڵ تۆیەک پەنیری برژاودا.

**چیزخـــور** / čîzxor/: *صــفت.[گفتــاری]* دەرمان‌خوارد؛ دەرمان‌وار؛ دەرمـان‌داو؛ نـەخۆش بە هۆی دەرخوارد درانی شـتێکی نالـەبار (وەک ژار) ‹مادرش فکر مـی‌کـرد او را چیزخـور کـرده باشـند: دایکی وای بۆ دەچوو دەرمان‌خواردیان کردبێ›.

**چیزدار** / čîzdār/: *صفت.[گفتاری]* دەوڵـەمەن؛ دەوڵەمەند؛ دەوڵەتمەند؛ دارا؛ بوودە ‹پدر عـروس چیزدار است: باوکی بووک دەوڵەمەندە›.

**چیـــزفهم** / čîzfahm/: [فارسـی/ عربـی] صــفت. *[گفتاری]* تێگەیشتوو؛ ژیرلۆ؛ ژیرلە؛ ژیرلێ؛ فامیدە؛ چنـەیاوا؛ بـە توانـایی تێگەییـشتن و بـڕیاردانی دروسـت ‹آدم چیـزفهم بـا یـک اشاره همـه چیـز را می‌فهمد: مرۆی تێگەیشتوو بە هێمایـەک لـە هـەموو شتێک تێدەگا›.

**چیزی**[1] / čîzî/: *قید*. شتێک؛ شتێ؛ چتێ؛ چێوێو؛ چێویە ‹چیزی حدود صد نفر؛ از غذایت چیزی هـم بـه گربـه بـده: شـتێ دەور و بـەر سـەد کـەس؛ لـە چێشتەکەت شتێک بە پشیلەکەش بدە›.

**چیـزی**[2]: ضـمیر. شـتێکی؛ چتێکـی؛ چێوێـوش؛ چێویەش ‹چیزی نداشت: شتێکی نەبوو›.

**چیـست** / čîst/: ضـمیر. چیـە؛ چـەس؛ چەسـە؛ چێشا؛ چێشەن؛ وشەی پرسیار؛ لە بارەی کەسی سێهەمی تـاکی بـێ‌گیانـەوە ‹آن چیـست؟: ئـەوە چیە؟›.

**چیستان** / čîstān ، ـها/: *اسم.[ادبی]* مەتەڵـۆک؛ مەتەڵ؛ مەتەڵە؛ مەتهەڵ؛ مەتهەڵـۆک؛ قەوسـەل؛ چمـام؛ چمامـک؛ فیـشاردە؛ تـشتانۆک؛ لیچـار؛ دەناچیە؛ شتێکانی؛ مامک؛ قاف؛ پەردەک؛ گوتە یـان نووسـراوەیەک کـە مەبەسـت و واتـای شاردراوە و پێوارە.

**چیستی** / čîstî/: *اسم.[ادبی]* چۆنیـەتی؛ چیـدکی؛ چلۆنایەتی؛ چۆنی؛ چەینی؛ لە چی و بە چ شێوە بـوونی شـتێ ‹از چیـستی ایـن مـاجرا کـسی چیـزی نمی‌داند: لـە چونیـەتی ئـەم ڕووداوە کـەس شـتێک نازانێ›.

**چیلـر** / čîler ، ـهـا/: [انگلیـسی]/*اسم*. سەرماسـاز؛ چیلێر؛ فێنک‌کەرەوە؛ بەشـێ لـە کەرەسـەی بـا گۆڕین کە کاری سارد کردنەوەی ئاوی لەگەڕی دەزگایە.

**چین**[1] / čîn ، ـها/: *اسم*. ۱. چـین؛ لـۆ؛ لـۆچ؛ لان؛ هێڵی بەرز و نزمی پەیتا ـ پـەیتا کـە بـە هـۆی هەڵگـلۆفان یـان نووشـتانەوەوە لـە ڕوویـەکی لووسـدا بـەدی دێ ‹چـین دامـن: چـینی دامـەن› ۲. گنج؛ لۆچ؛ لووچ؛ چرچ ‹چین کوچکی در گوشەی چشمانش دیده می‌شد: گنجێکی چکوولە لـە گۆشـەی چاوانیەوە دەبینرا› ۳. *[زمین‌شناسی]* چین ـ چـین؛ لا ـ لا؛ توێژ؛ دەق بەسـتنی چینـەکانی زەوی بـە هۆی جووڵانەوەی توێکـڵی زەویـن ٤. *[گفتـاری]* کار و ڕەوتی دوورین؛ ڕنینـەوە؛ چـنین؛ دروون؛ دروێنە و دوورینی گیا ٥. تاش؛ بەر؛ چن؛ چین؛ بەرچن؛ ئەوەی لە نۆبەیەکدا دەچندرێتەوە.

▣ **چـــین خـــوردن**: لـــۆچ تێکـــەوتن؛ لـــۆ تێکـەوتن؛ تـا خـواردن؛ نووشـتاوەیی یـان دەق لـێ‌پەیـدا بـوون ‹یکـی از صـفحات کتـاب زیـر ماشـین چـین خـورد: پـەڕێ لـە کتێبەکـە لـە ژێر ماشیندا لوچی تیکەوت›.

**چین دادن**: چین دان/ پێـدان؛ لـۆ دان؛ تـوێ خستن و خەت بـەدی هێنـان ‹پایین دامـن را چین بدە!: خوار دامەنەکە چین بدە!›.

**ـ چین**[2]: *پیـوازه*. ـ چن: ۱. ـ چنە؛ ـگیر؛ ئـەوەی شتێک ئەچنێتەوە ‹موچین: مووچن› ۲. ـ بژێـر؛ چنراو بە هۆی کەسێ یان شتێکەوە ‹دسـت‌چین: دەس‌چن› ۳. کۆکـەرەوە؛ خرکـەرەوە ‹خبـرچین: هەواڵ‌چن›.

**چین‌چیلا** / čînčîlâ ، ـهـا/: [انگلیـسی از اسـپانیایی]

/اسم. چین‌چیلا؛ گیانەوەرێکی گوانداری چکۆلەی ئامرێکای باشووریە بە پێستێکی نەرم و بۆرەوە کە زۆر بەنرخە.

**چین‌خوردگی** / činxordegî/: اسم.
١. چین‌چینی؛ چیناوچینی؛ لۆچی؛ گرژهەلاتوویی؛ کار یان ڕەوتی چین تێکەوتن ‹پوستەی زمین بر اثر سرد شدن دستخوش چین‌خوردگی شد: پێستەی زەوی بە هۆی ساردەو بوونەوەوە تووشی چین‌چینی بوو› ٢. /ها/ چین‌ـچین؛ لاـ لا؛ توێـ توێ؛ جێگایەک کە چینی تێکەوتووە، بەتایبەت توێکڵەی زەوین.

**چیندار** / čîndār ، ـها/: صفت. چیندار؛ چیناوی؛ چین‌چیناوی؛ بە چین و گنج ‹دامن چیندار: دامەنی چیندار›.

**چین و تبتی** / čîn-o-tabbatî/: اسم. چین و تەببەتی؛ لقێ لە زمانگەلی ئاسیایی کە بریتیە لە سێ زمانی چینی و تەببەتی و برمەیی.

**چین‌وچروک** / čîn-o-čorûk/: اسم. چرچولۆچ؛ خوز؛ گنج؛ چرچ؛ لا سەر لا؛ توێ لە سەر توێ؛ پۆت؛ قرمچی؛ گنج‌وگرژ.

**چین‌وشکن** / čîn-o-šekan ، ـها/: اسم. [ادبی] چین‌وگنج؛ چین‌ـ چین؛ خوز؛ دۆژەنگ؛ چەم و خەمی توێ‌ـتوێ و لە سەر یەک.

**چینه** / čîne ، ـها/: اسم. ١. [زمین‌شناسی] تۆژ؛ توێیەکی بەرچاو لە پێستی زەوین (وەک تۆژی بەرد) کە ئەستووری لە چەند سانتیمیترەوە هەتا چەند میترە ٢. چینە؛ موور؛ مۆرە؛ ڕیزی دیوار لە قوڕ ٣. چینە؛ دان؛ چیمک؛ تۆم و دانەوێڵەیەک کە پەلەوەران دەیخۆن.

▣ چینه کشیدن: چینەکێشان؛ دیواری قوڕ دانان.

**چینه‌بندی** / čînebandî ، ـها/: اسم. [زمین‌شناسی] چینەبەندی؛ ڕیزمان یان چۆناوچۆنی قەلاپەچن بوونی مەوادای گڕکانی یان تۆژەگەلی گیرهەیی کە زۆرتر بە شێوەی ئاسۆییە.

**چینه‌دان** / čînedān ، ـها/: اسم. سیقلدان؛ سیقلدانک؛ سیقڵدانە؛ سیق؛ سیقە؛ جیقەڵدان؛ جیقڵدان؛ جیقڵدو؛ جیکڵدانە؛ پەزیرانک؛ گژار؛ گژاژ؛ بەرجۆم؛ بەرچینەک؛ هێرک؛ کەلناس؛ جیقنەمەل؛ قیسک؛ قیسکە؛ کاسینۆک؛ جیقەڵدوو؛ گەپرووک؛ چینەدوو؛ بەشی پەرەسەندوو لە گەرووی پەلەوەران و هەندێک لە بربڕەداران کە دان و خۆراکی لێ خڕ دەبێتەوە.

**چینه‌شناسی** / čînešenāsî/: اسم. [زمین‌شناسی] چینەناسی؛ لقێ لە زانستی زەویناسی، کە لەمەڕ چۆناوچۆنی بەدیهاتن، ڕیزمان، لە شوێن یەکی و پێکهاتەی کێوان و بەردناسی و لۆ و چینگەلی تۆکڵەی زەوی دەکۆڵێتەوە.

**چینی**[1] / čînî/: اسم. چینی: ١. /ها؛ ـآلات؛ ـجات/ فەخفووری؛ جۆرێ سواڵەتی هەرە باش، بریقەدار و ساف و لووس کە ئیرباری لێ دروست دەکرێ. هەروەها: **چینی‌سازی؛ چینی‌فروشی** ٢. /ها؛ ـان/ هەر یەکە لە دانیشتوانی چین یان منداڵەکانیان ٣. گرۆیەک لە زمانەکانی چین و تەببەتی کە شێوە گوتنی جیاواز، بەلام شێوە نووسینی وەک یەکیان هەیە، بەتایبەت زمانی ماندارەن.

**چینی**[2]: صفت. چینی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ولاتی چین ‹خط چینی: خەتی چینی›.

**چینی‌بندزن** / čînîbandzan ، ـها/: اسم. گاوکەر؛ کەسێ کە لەت‌وکوتی دەفری شکاوی چینی دەلکێنێتەوە.

**چینی‌جا** / čînîcā ، ـها/: اسم. بووفە؛ جێگای فرۆتنی خۆراکی و نۆشابە و چەرەز لە شوێنگەلی گشتیدا (وەک سینەما، ناو قەتار، گەمیە و زانکۆ و...).

# ح

**ح** / h/: *حرف.* ح؛ نیشانەی؛ هەشتەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی. ئەم پیتە کە لە زمانی فارسی ڕەسەندا نیە و لە عەرەبیەوە هاتووە، هەر وەک «هـ» دەخوێنرێتەوە.

**ح** / he/: *اسم.* ١. حێ؛ ناوی هەشتەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی ٢. *[مخفف]* دەوروبەر؛ دەورەی؛ سووکەڵەی وشەی «حدود» ‹ح ٢٠ متر: دەوروبەری ٢٠ متر›.

**حا** / hā/: [عربی]*اسم.* حا؛ حێ؛ نێوی عەرەبی هەشتەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**حائز** / hā'ez/: [عربی] ☜ **حایز**

**حائض** / hā'ez/: [عربی] ☜ **حایض**

**حائل** / hā'el/: [عربی] ☜ **حایل**

**حابس** / hābes/: [عربی] *صفت.* ـگرسێن؛ بەرگر ئەوەی بەر لە چوونی شتێک بگرێ و ڕایگرێتەوە ‹چای خشک و ماست حابس شکم است: چای وشک و ماست زگ گرسێنە›.

**حاتم‌بخشی** / hātambaxšî/: [عربی/ فارسی]*اسم.* ١. *[کنایی]* تەخشان ــ پەخشان؛ تەخشان و پەخشان؛ دەس‌بلاوی؛ بەخشین بەبێ حەساو و ئەژمار ٢. *[تعریض]* کار یان ڕەوتی بەخشینی شتێ (زۆرتر شتێ کەم و بێ‌بایەخ) ‹تو طلب مردم را بده، لازم نیست حاتم‌بخشی کنی: تۆ قەرزی خەڵکی بدەرەوە، تەخشان و پەخشان پێشکەشی خۆت›.

**حاج** / hāc/: [عربی] اسم. ١. *[ادبی]* ☜ **حاجی** ٢. *[گفتاری]* حاجی؛ هەجی؛ ئەو کەسە فەرزی حەجی بەجێ‌هێناوە ‹حاج علی: حاجی عەلی›.

**حاجات** / hācāt/: [عربی] جمعِ ☜ **حاجَت**

**حاج‌آقا** / hācāqā ، ـها/: [عربی/ مغولی]/*اسم.* ١. حاجی؛ هەجی؛ خاڵەحاجی؛ مامەحاجی؛ نازناوی پیاوانی حەج ڕۆیشتوو ٢. ئاحاجی؛ خاڵۆ؛ مامە؛ نازناوێ بۆ پیاوانی بەتەمەنی موسوڵمان ‹حاج‌آقا نوبت شماست: ئاحاجی نۆرەی ئێوەیە› ٣. مامۆستا؛ مەلا؛ حاجی مامۆستا؛ نازناوی مەلای شیعە ‹حاج‌آقا نماز می‌خواند: مامۆستا نوێژ دەخوێنێ› ✽ **حاجی‌آقا**

**حاجب** / hāceb/: [عربی]/*اسم.* ١. /ـها؛ ـان/ *[قدیمی]* دەرکەوان؛ درکەوان؛ دەرگەوان؛ درگاوان؛ دەروان؛ دەربان؛ دەروازەوان؛ قاپچی؛ قاپیەوان؛ قاپێوان ٢. *[نامتداول]* لەمپەر؛ بەرگر؛ کۆسپ؛ پەردە؛ پەردەوا؛ پاردە؛ بەرهەڵست؛ گەپل؛ ڕتم؛ دارەست.

**حاجت** / hācat ، ـها؛ حاجات؛ حوایج/: [عربی]/*اسم.* ١. پێداویستی؛ ئاتاجی؛ دەروایسی؛ نیاز؛ کەمایەسی؛ پێویستی؛ پێدڤی؛ پێدڤیاتی ٢. *[گفتاری]* ئامراز؛ ئامێر؛ ئالاف؛ هۆ؛ کەرەسە.

▣ **حاجت کار**: ئامرازی کار؛ ئامێری کار. هەروەها: **حاجت منزل**

◘ **حاجت برآوردن:** پێداویستی/ ئاتاجی/ نیاز بەجێ هێنان؛ نیاز هێنانەدی؛ نیاز بەگا ئاردەی ‹حاجت او را براورد: نیازەکەی بەجێ هێنا›.

**حاجت خود را گرفتن:** بەجێ هاتنی نیاز؛ نیازی دڵ هاتنەدی؛ نیاز بەگا ئامەی؛ دابین بوونی خواز و نزا.

**حاجت داشتن:** بەنیاز بوون؛ پێداویستی/ پێویستی/ ئاتاجی هەبوون؛ نیازمەند بوون ‹پیرزنی آمده بود و حاجتی داشت: پیرەژنێک هاتبوو، نیازیکی هەبوو›.

**حاجت کسی را دادن:** نیازی کەسێ هێنانەدی؛ دۆعای کەسێ بەجێ هێنان ‹یارب حاجت ما را بده!: خوایە نیازمان بینە دی!›.

**حاجت کسی روا شدن:** نیازی کەسێ بەدیهاتن؛ دۆعا/ نیاز/ ئاواتی کەسێ هاتنەدی. هەروەها: **حاجت کسی را روا کردن**

**حاجت طلبیدن:** نیازکردن؛ پاڕانەوە؛ لالانەوە؛ بە دۆعا کردن لە بارەگای خودا خوازیاری بەدیهاتنی نیازی خۆ بوون.

**حاجتمند** / hācatmand، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ۱. نیازمەند؛ بەنیاز؛ ئاتاج ۲. دەستەنگ؛ نەدار؛ بەلەنگاز؛ هەژار؛ پەژۆم.

**حاج‌خانم** / hācxānom، ـها/: [عربی/ ترکی] *اسم.* ۱. حاجیە؛ حاجی‌خانم؛ حاجی‌ژن؛ نازناوێ بۆ ژنانی موسوڵمانی حەج ڕۆیشتوو ۲. دایەحاجی؛ دایە؛ نازناوێ بۆ ژنانی موسوڵمانی بەتەمەن ✱ **حاجی‌خانم**

**حاجز** / hācez/: [عربی] ☜ حجاب حاجز، **حجاب**

**حاجی** / hācî، ـها؛ ـان؛ حُجّاج/: [از عربی] اسم. حاجی: ۱. کەسێ کە بۆ زیارەت چووبێتە ماڵی خودا ۲. ئاحاجی؛ مامەحاجی؛ باوەحاجی؛ خاڵەحاجی؛ نازناوێکی پیاوانی موسوڵمان ✱ **حاج** *[ادبی]*

◘ **حاجی‌ـحاجی مکه:** *[کنایی]* بە برای بڕ چوون؛ نەدیەیەوە دما؛ چوونی بێ‌گەڕانەوە ‹پول را گرفت و رفت حاجی‌ـحاجی مکه، دیگر او را ندیدیم: پارەکەی وەرگرت و بە برای بڕ چوو و ئیتر نەماندیەوە›.

**حاجی‌ارزانی** / hācî'arzānî/: [از عربی/ فارسی] *اسم. [کنایی]* حاجی هەرزانی؛ کاسبی هەرزانجان؛ دووکانداری هەرزان‌فرۆش.

**حاجی‌آقا** / hācîāqā/: [از عربی/ مغولی] ☜ **حاج‌آقا**

**حاجی‌بازاری** / hācîbāzārî، ـها/: [از عربی/ فارسی] *اسم. [مجازی]* حاجی‌بازاڕی؛ بازرگانی زۆر دەوڵەمەندی حوجرەنشین ‹بعدها شنیدیم که زن یک حاجی‌بازاری شده است: دوایی بیستمانەوە کە بووە بە ژنی یەکێکی حاجی بازاڕی›.

**حاجی‌خانم** / hācîxānom/: [از عربی/ ترکی] ☜ **حاج‌خانم**

**حاجی‌فیروز** / hācîfîrûz، ـها/: [از عربی/ فارسی] *اسم.* حاجی فیرووز؛ پیاوێ کە لە ڕۆژانی ئاخری ساڵدا ڕوومەتی ڕەش دەکا، جل‌وبەرگی ڕەنگاوڕەنگ و سەیر دەپۆشێ و لە شەقام و کۆڵانان بە دایرەکەیەوە دەخوێنێ و هەڵدەپەڕێ و خەڵکیش بە خەڵات شتێکی دەدەنێ.

**حاجی‌لکلک** / hācîlaklak، ـها/: [از عربی/ فارسی] *اسم. [گفتاری]* حاجی‌لەقلەق؛ حاجی‌لەگ‌لەگ؛ لەق‌لەق؛ لەگ‌لەگ؛ لەگ‌لەگە؛ باڵدارێکی قاچ و دندووک درێژی بەڵەکە.

**حاجیه** / hāciye/: [از عربی] *اسم. [ادبی]* حاجی‌خانم؛ حاجی‌ژن؛ حاجیە؛ ژنێ کە ڕۆیشتبێت بۆ حەج.

**حاد** / hād(d)/: [عربی] *صفت.* حەستەم؛ ئاستەم: ۱. *[نامتداول]* تون؛ تیژ؛ تێژ ۲. سەخت؛ نەخۆشی تووش ۳. *[مجازی]* دژوار؛ گژ؛ تۆخ ‹وضع حاد: بار و دۆخی دژوار›.

**حادث** / hādes/: [عربی] *صفت.[ادبی]* بەدیهاتوو؛ ڕووداوە؛ دیاردە؛ پێکهات؛ بۆ لەواو یان بە تایبەتمەندی بەدیهاتن و ڕوودان ‹جمعی جهان را حادث می‌دانند و جمعی دیگر قدیم: تاقمێ جیهانیان لا بەدیهاتووە و برێکیش بە کۆنی دەزانن›.

◘ **حادث شدن:** ڕوودان؛ ڕووەدەی؛ بەدیهاتن ‹بلای سختی حادث شد: بەڵایەکی ناخۆش ڕووی‌دا›.

**حادثات** / hādesāt/: [عربی] جمعِ ☜ **حادثه**

**حادثه** / hādese ، ـها؛ حَوادث؛ حادثات/: [عربی]/*اسم.* ۱. ڕووداو؛ بار و دۆخێکی کتوپڕی و زۆرتر ناخۆش ‹سبب حادثه را پیدا کردند: هۆی ڕووداوەکەیان دۆزیەوە› ۲. کارەسات؛ کارەوڕەهات؛ کەت؛ ڕووداوی ناگە و ناگەوار ‹حادثەی رانندگی: کارەساتی ڕانەندەیی›.

◘ **حادثه آفریدن:** قەوماندن؛ کارەسات نانەوە؛ کەتن ژەی.

**حادثه‌آفرینی** / hādese'āfarînî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کارەساتسازی؛ کار و ڕەوتی قەوماندن؛ کارەسات نانەوە. هەروەها: **حادثه‌آفرین**

**حادثه‌جو** / hādesecû ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* سەربزێو؛ سەربزۆک؛ سەربزۆت؛ لقۆک؛ لقەک؛ سەرهار.

**حاده** / hādde/: [عربی] ☜ زاویەی حادّه، **زاویه**

**حاذق** / hāzeq/: [عربی] *صفت.[ادبی]* پسپۆڕ؛ شارەزا؛ شاز؛ شەهرەزا؛ لێزان؛ خارا و وریا لە کار ‹پزشک حاذق: بژیشکی پسپۆڕ›.

**حاره** / hārre/: [عربی] *صفت.[قدیمی]* گەرمێن؛ گەرمیان؛ ئاران؛ گەرمەسێری ‹منطقەی حارە: ناوچەی گەرمێن›.

**حاسد** / hāsed/: [عربی] ☜ **حَسود**

**حاشا** / hāšā/: [عربی] *صوت.* هەرگیز؛ حاشا؛ هاشا؛ هەشا؛ قەت ‹حاشا که من این کار را بکنم: هەرگیز ئەگەر ئەم کارە بکەم›.

◘ **حاشا کردن:** حاشا کردن؛ حاشا لێکردن؛ ئینکارکردن؛ خوەنین؛ بە ژێرا دان ‹وقتی که در این‌باره از او پرسیدم حاشا کرد که اصلاً خبر داشته باشد: کاتێ کە لەم بارەوە لێم پرسی حاشای کرد کە هەر ئاگای لێ‌بووبێ›.

**حاشا و کلا** / hāšā-vo-kallā/: [عربی] *صوت.* هەرگیزای هەرگیز؛ هەرگیزان هەرگیز؛ حاشەوەلیلا؛ قەت قەت؛ بە هیچ بارێکدا نە ‹من این را گفته باشم؟ حاشا و کلا: من ئەمەم گوتبێ؟ هەرگیزای هەرگیز›.

**حاشیه** / hāšiye ، ـها؛ حَواشی/: [عربی]/*اسم.* ۱. پەراوێز؛ پەڕاوێز؛ پەڕ؛ کەنارە؛ کەنار؛ کەف؛ زێوار؛ ئاوێز؛ کەنارەی هەر شتێ ‹حاشیەی فرش: پەراوێزی قالی› ۲. پەراوێز؛ پەڕاوێز؛ کەنارە؛ سپیایی دەوراندەوری لاپەڕەی قاقەز ‹در حاشیەی نامه نوشته بود: لە پەراوێزی نامەکەوە نووسیبووی› ۳. پەڕاوێز؛ پەڕاوێز؛ کەنارە *الف)* پیارزگ؛ ئەوەی کە بە سەر ئەو بەشە سپیەی قاقەزەوە بنووسرێت ‹حاشیه به خط دیگری بود: پەراوێزەکە بە خەتێکی‌تر بوو› *ب)* زێوار؛ خەملاوی و گوڵ و نیگارێک کە لەو بەشە سپیەدا نووسرابێ ‹قرآن با حاشیەی گُل و بُتّه: قورئان بە پەراوێزی گوڵ و بتەوە› ٤. *[مجازی]* قسە یان وتارێ کە لە بواری باسەکەدا نەبێ؛ چۆنیەتی لە قسە لادان ‹چرا حاشیه می‌روی؟: بۆ لە قسەکە لادەدەی؟›.

◘ **حاشیه دوختن:** زێوارگرتن؛ پەراوێز لێنان؛ کەفاندن؛ پەراوێزگیرتەی؛ بە دەوری شتێکدا (بۆ جوانی یان پاراستن) باریکەیەک دوورین، لکاندن یان کێشان.

**حاشیه رفتن:** *[کنایی]* ئەمبەر و ئەوبەر/ ئەمپەل و ئەوپەل کردن؛ لە قسە لادان؛ چوونە دەرەوە لە ئامانجی قسەوباس؛ لادان لە چەمکی باس.

**حاشیه نوشتن:** پەراوێز نووسین؛ لێکدانەوە و تێبینی خۆ لە مەڕ نووسراوەیەکەوە لە خوار و کەناریدا نووسین.

**به حاشیه پرداختن:** *[کنایی]* کولکه چنینه‌وه؛ وردەوپردە شی‌کردنەوە؛ خۆ بە شتی بێبایەخەوە خەریک کردن.

**حاشیه‌ای** / hāšiye'î/: [عربی] *صفت.* ۱. پەراوێزی؛ کەنارەیی؛ زێواری؛ گەڤەری؛ پێوەندیدار یان سەر بە پەراوێزەوە ۲. *[مجازی]* لە پەراوێز؛ لا؛ بەلا؛ دوور لە مەبەست؛ لابەلا؛ لاوەلا ‹لطفاً از بیان مطالب حاشیه‌ای خودداری کنید: تکایە لە پەراوێز قسە مەکەن›.

**حاشیه‌نشین** / hāšiyenešîn ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* کەنارنشین؛ پەراوێزنشین؛ زێوارنشین؛ خاوەن خوو و خدە یا تایبەتمەندی کەنارنشینی.

**حاشیه‌نشینی** / hāšiyenešnî/: [عربی/ فارسی]/*سم.* کەنارنشینی؛ پەراوێزنشینی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی بەشدار نەبوون لە دەستە یان کاری دەستەیی و بە کۆمەڵ ۲. نیشتەجێ بوون لە کەناری شاردا ‹حاشیه‌نشینی پدیده‌ی شهرهای بزرگ است: کەنارنشینی دیاردەی شارە گەورەکانە›.

**حاصل** / hāsel ، ـها/: [عربی]/*سم.* ۱. داهات؛ دەسهات؛ دەسکەوت؛ بەرهەم؛ بەرووچە؛ بەرکەوت؛ بەر؛ وەر؛ بەهرە؛ ئەوەی کە لە شتێ، جێگە یان کارێ بە دەس دێ: *(الف)* بەری کشت و کاڵ ‹امسال باغمان حاصل خوبی داشت: ئەوساڵ باخەکەمان بەرهەمی باشی بوو› *ب)* داهاتی کردوکاشێک ‹حاصل فعالیتهای اقتصادی: داهاتی کارگەلی ئابووری› ۲. ئەنجام؛ ئاکام؛ سەرئەنجام؛ ئاکامی کار یان ڕەوتێک ‹کار بی‌حاصل: کاری بێ‌ئاکام›.

▣ **حاصل جمع:** *[ریاضی]* کۆ؛ بەرکۆ؛ سەرەنجامی کۆکردنەوە.

**حاصل ضرب:** *[ریاضی]* سەرەنجامی چەندپاتە کردنەوە.

**حاصل مصدر:** *[دستور]* بەرچاوگ؛ وشەیەک کە وەکوو چاوگ نیشانەی ئەنجام بوونی کارێکە، بەلام وەکوو چاوگ داناڕێژرێت و نیشانەی چاوگی پێوە نیە (وەکوو وتن و وتار، کە یەکەم چاوگ و دووهەمین بەرچاوگە)

▣ **حاصل برداشتن:** بەرهەم/ دەسکەوت هەڵگرتن؛ دەسهات هەڵگرتن؛ بەر هەڵگرتن ‹از هر هکتار سه تن حاصل برداشتیم: لە هێکتارێکدا سێ تۆن بەرهەممان هەڵگرت›.

**حاصل دادن:** ۱. بەردان؛ بەرهەم دان؛ دەسهات دان؛ دەسکەوت دان ‹آنجا زمینش شور است و حاصل نمی‌دهد: ئەوێ زەمینەکەی سوێرە و بەرهەم نادا› ۲. ئاکام دان؛ هاتنە بەرهەم ‹این تلاش به این زودی حاصل نمی‌دهد: ئەم تێکۆشانە بەم زووانە ئاکام نادا›. هەروەها: **حاصل داشتن**

**حاصل کردن:** بەدەس هێنان؛ هەڵکڕاندن ‹آیا می‌شود از این کار سودی حاصل کرد: تۆ بڵێی لەم کارە قازانجێک بەدەس بێنین›.

**حاصلخیز** / hāselxîz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* نەخت؛ ئادان؛ بە بەروبووم؛ بەبڕشت؛ زەوی بەپیت و ڕێژەو ‹زمین حاصلخیز: زەوی نەخت›. هەروەها: **حاصلخیزی**

**حاضر** / hāzer/: [عربی] *صفت.* ۱. ئامادە؛ تەیار؛ ساز؛ بەرهەڤ؛ گیڤ؛ گیف؛ گورج؛ چوخ؛ لەباو ۲. ئامادە؛ ساز؛ دابین؛ ئابوور؛ گیف؛ گیڤ؛ لە بەردەست ۳. /ـها/ ئامادە؛ هێبەر؛ هە بوون لە جێگەی قسە لێوە کراو ٤. ئەم؛ ئێستە؛ ئیسە؛ ئیسا؛ ئێستا؛ ئەمێستا؛ نها؛ ڤێگاڤی؛ ڤێگەڤی؛ هەنووکە؛ نووکە؛ نهۆ؛ ئەوەی کە ئێستا هەیە ‹هژار از مشهورترین دانشمندان عصر حاضر در کردستان است: هەژار لە بەناوبانگترین زانایانی ئەم چەرخەی کوردستانە›.

▣ **حاضر بودن:** ئامادە بوون: ۱. ساز بوون؛ بەرهەڤ بوون؛ گیف بوون ‹او حاضر است کار کند: ئەو ئامادەیە کار بکا› ۲. لە بەردەست

بوون؛ دابین بوون ‹پول حاضر است؛ غذا حاضر است: پاره لـه بەردەسـتدایه؛ خـواردن ئامادەیـه› ۳. هێبەر بوون؛ پێک هاتن؛ لەوێ بوون؛ بوون لە جێگایەک کە قسەی لێوە دەکرێ ‹ما هر دو آنجا حاضر بودیم: ئێمە هەر دووکمان لەوێ ئامادە بووین› ٤. حازر بوون؛ پێکهاتن؛ گیـف بـوون؛ ئامادە بوون بۆ قەبوول کردنی شـتێک ‹حاضر نیست آشتی کند: لە سەر ئاشـتی پێـک نایـەت›.

هەروەها: **حاضر شدن**

**حاضـر کـردن:** ۱. ئامـادەکردن؛ تـەیارکردن؛ سازکردن ‹کتابها را حاضـر کـن ببـرم: کتێبـەکان ئامادە کە بیانبـەم› ۲. ئامادە کردن؛ بردن یـان هێنان بۆ جێگایەک کە قسەی لێـوە دەکـرێ ‹همەی شرکا را حاضر کنیـد: هـەموو بەشـدارەکان ئامـادە بکـەن› ۳. فێـر بـوون؛ لـە بـەرکردن؛ وەرکەردەی؛ ڕەوان‌کـەردەی ‹درسـت را حاضـر کردەای؟: وانەکەت لە بەر کـردووە؟›. هـەروەها: **حاضر شدن**

**حاضرالذهن** / hāzerozzehn/: [عربی] *صفت.* لـه سەر بیر؛ لە سەر یاد؛ خاوەن زەینێکی ئامـادە و شـیاو بـۆ بـیر هێنانـەوە و تێفکـرین ‹مـن الآن حاضرالذهن نیستم، باید به یادداشتهایم مراجعه کنم: من ئێـستەکانێ لـە سـەر بـیر نـیم، ئـەبێ تەمەشـای نووسراوەکانم بکەمەوە›.

**حاضرباش** / hāzerbāš/: [عربی/ فارسی] *اسم.* تـیر لە کـەوان؛ وازری؛ ئامادەبـاش؛ بـار و دۆخ یـان چۆنیەتی ئامـادە بـوون لـە بەرانبـەر مەترسـیدا ‹آمادەباش در برابر سیل: وازری لە بەرانبەر لافاودا›.

**حاضرجواب** / hāzercavāb/: [عربی] *صفت.* بـۆ قسە دانەماو؛ ئامادە بۆ پەرسف دانەوەی خێـرا و (زۆرتریش) شیاو.

**حاضـرجوابی** / hāzercavābî ، ـهـا/: [عربـی] */اسـم.* بـۆ قـسە دانـەماوی؛ تـیر لـە کـەوانی: ۱. دۆخ یـان چۆنیـەتی بـۆ قـسە دانـەمان ۲. پەرسـقێ کـە شـیاو و چـاک و زوو بدرێتـەوە ‹ایـن را مـی‌گوینـد «حاضـرجوابی»: بەمـە ئێژن «بۆ قسە دانەماوی»›.

**حاضردرصـحنه** / hāzerdarsehne/: [عربـی/ فارسی/ عربی] *صفت.* گورج و گیـف لـە بەشـداری کردنی چالاکی ڕامیاری و چەکداریدا.

**حاضـرغایب** / hāzerqāyeb/: [عربـی] */اسـم.* *[گفتاری]* بوون و نـەبوون: ۱. چۆنیـەتی هـەبوون یان نەبوون لە شوێنێکدا ۲. کـار و ڕەوتی تـاقی کردنەوەی ئامادە بوونی کەسـانی پێویـست لـە شوێنێکدا.

**حاضرکردنی** / hāzerkardanî/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ۱. ئامادەکردنی؛ سازکردنی؛ شیاو و لـەبار بۆ پێگەیانـدن ۲. بـۆ لەبـەرکردن؛ لەبـەرکردنی (سەبارەت بە دەرس)؛ شیاوی فێـر بـوون ‹دیـشب ۵۰ صـفحه درس حاضـرکردنی داشـتم: دوێـشەو ۵۰ لاپەڕە وانەم بۆ لەبەرکردن هەبوو›.

**حاضـر و نـاظر** / hāzer-o-nāzer/: [عربـی] *صفت.* حـازر و وازر؛ حـازر و بـازر؛ بـە دۆخ یـان چۆنیـەتی هـەبوون لـە جێیەکـدا و دیـتنی ئـەوەی دەوێـدا ڕووی داوە ‹خـودم در آنجـا حاضـر و نـاظر بـودم و همـه چیـز را مـی‌دیـدم و مـی‌شـنیدم: بـۆ خـۆم لەوێـدا حـازر و وازر بـووم و هەموو شتێکم دەدی و دەبیست›.

**حاضری** / hāzerî/: [عربی] *اسم.* حـازری؛ ئامـادە؛ خواردنێک کە پێویستی بە لێنان (کولانـدن یـان برژاندن) نەبێ.

**حاضریراق** / hāzeryarāq/: [عربی/ ترکی] *صفت.* *[کنایی]* تەیار؛ ساز؛ لەباو؛ گورج؛ گیڤ؛ گیـف؛ لـە سەرپێ؛ ئامادەی کار، بەتایبەت بۆ ڕۆیـشتن بـۆ جێگایەک.

**حافظ** / hāfez ، ـان/: [عربـی] */اسـم.* ۱. پاسـەوان؛ پارێزەر؛ پارێزوان؛ نواوان ۲. حـافز؛ کەسـێ کـە قورئانی لەبەر بێت ‹حافظ قرآن: حافزی قورئان›.

**حافظـه** / hāfeze/: [عربـی] */اسـم.* حـافزە؛ بـیر؛ یادگە: ۱. بیرەوەری؛ یاد؛ یاو؛ یای؛ ویر؛ توانـایی

زەینی بۆ بیر هێنانەوە یان دووپات کردنەوەی شتگەلی فێربوو ‹معلم تاریخ ما حافظەی خوبی داشت: مامۆستای مێژووەکەمان بیرێکی تیژی هەبوو› ۲. لەبەر؛ کۆمەڵێک لە ئاگاداری کە بە تێکۆشان یان ئەزموونی گیانەوەرێک وەرگیراوە و بە گۆڕانی بار و دۆخ یان بە هۆی ڕووداوێکەوە خۆی دەردەخا ‹او همەی نامها را از حافظه می‌گفت: ئەو هەموو ناوەکانی لەبەر دەگوت› ۳. ئامێرێک لە کەرەسەیەکدا کە هەموو جۆرە ئاگاداری و زانیاری تێدا هەڵدەگیرێ و لە کاتی پێویستدا کەلکی لێ دەگیرێتەوە، بەتایبەت بۆ کۆمپیۆتەر ٤. توانای هەڵگرتنی ئاگاداری و زانیاری.

**حاکم**[1] / hākem ، ـان؛ حُکّام/: [عربی] /اسم. ۱. فەرمانڕەوا؛ دەسەڵاتدار؛ کاربڕ؛ میر؛ کەیخودا؛ دانیر؛ ڕاژۆر؛ ئەوی حوکم دەکا ۲. دادوەر؛ حاکم؛ کەسێ کە بە سکاڵای خەڵک ڕادەگا ۳. /قدیمی/ فەرماندار.

▣ **حاکم شرع**: دادوەری شەریعەت؛ حاکمی شەرع؛ کەسێ کە سەبارەت بە کار وباری دینی بەتایبەت لادان لە فەرمانی شەرع حوکم دەکا.

**حاکم مطلق**: تاکە دەسەڵاتدار؛ دەسەڵاتداری بێبەرهەڵست؛ کەس، دەستە یان دامەزراوەیێک کە بە تەنیایی و بەبێ ڕاوێژ و دەستێوەردانی دیتران حکوومەت دەکا.

**حاکم**[2]: صفت. دەسەڵاتدار؛ ڕاژوور؛ ڕاژۆر؛ بەدەسەڵات ‹حزب حاکم: حیزبی دەسەڵاتدار›.

▣ **حاکم بودن**: ۱. زاڵ بوون؛ چیر بوون ‹سکوت بر همه جا حاکم بود: بێدەنگی بە سەر هەموو لایەکدا زاڵ بوو› ۲. فەرمانڕەوا بوون؛ میر بوون؛ حاکم بوون ‹فرمانفرما در شیراز حاکم بود: فەرمانفەرما لە شیرازدا فەرمانڕەوا بوو›.

هەروەها: **حاکم شدن؛ حاکم کردن**

**حاکمیت** / hākemîyyat/: [عربی] /اسم. ۱. دەسەڵاتداری؛ ڕاژۆریتی؛ دەزگای حکوومەت؛ دۆخ یان چۆنیەتی دەسەڵاتدار بوون ‹حاکمیت قانونی: دەسەڵاتداری قانوونی› ۲. /مجازی/ دەزگای حکوومەت؛ دەسەڵاتداریەتی؛ فەرمانڕەوایەتی ‹حاکمیّت در این مورد دخالت نمی‌کند: دەزگای حکوومەت خۆی لەم کارە نەدا›.

▣ **حاکمیت ملی**: دەسەڵاتداری نەتەوەیی؛ فەرمانڕەوایی نەتەوەیی؛ دەسەڵاتداری نەتەوەیەک بە سەر هەرێمی ڕامیاری خۆیدا.

**حاکی** / hākî/: [عربی] صفت. نیشاندەر؛ ڕاگەیێنەر ‹نامەاش حاکی از بیماری پدرش بود؛ رفتارش حاکی از ترس و بزدلی است: نامەکەی نیشاندەری نەخۆشی باوکی بوو؛ ئاکاری نیشاندەری ترس و کەلەزاتیە›.

**حال**[1] / hāl ، ـها؛ احوال/: [عربی] /اسم. ۱. حاڵ؛ چۆنیەتی؛ چلۆنایەتی؛ مەرە؛ بار؛ مەرەد؛ چۆنیەتی شتێ یان بار و دۆخی کەسێ (لە خراپی، باشی، گەرمی، ساردی، خۆشی، ناخۆشی) ۲. /گفتاری/ کەیف؛ خۆشی؛ سەرخۆشی ‹حال کردن: کەیف کردن› ۳. /دستور/ ئێستا؛ ئێستاکە؛ ئێستەکانێ؛ ئیسە؛ ئیرەنگە؛ ئەم کاتە تێداین (بۆ ئەنجامی کارێک یان ڕوودانی ڕووداوێک).

▣ **حال آنکه**: ئەگەر چی؛ وەلێکەتێ؛ ئەمایکەتێ؛ جە حاڵێوەنە؛ وشەیەک بۆ دەربڕینی بار و دۆخی پێچەوانە و هاوکات بە کار دەڕوا ‹مرا گرفتند و بردند، حال آنکه در آن کار دخالتی نداشتم: منیان گرت و بردمیان، ئەگەرچی لەو کارەدا هیچ دەستم نەبوو›.

**تا به حال**: تا ئێستە؛ تا ئێستا؛ تا ئیسە؛ تا ئێستەکانێ ‹تا بە حال او را ندیدەام: تا ئێستا نەیمدیوە›.

**در حال**: دەسبەجێ؛ گورج؛ گورجێ؛ ڕێوڕا؛ دەرلاد ‹در حال ریختند توی خانە: دەسبەجێ ڕژانە نێو ماڵەوە›.

**در حال حاضر**: ئێستە؛ ئێستێ؛ ئیسە؛ ئیسەنە؛ هەر ئێستە؛ هەر ئیسە؛ ئێستەکانێ؛ ئەمێستا؛ ئەوێستا؛ ئێستاکە؛ ئا لەم هەلەدا ‹در حال حاضر پول ندارم، ولی فردا شاید بشود کاری کرد: ئێستە پارەم نیە، بەلام بۆ بەیانی بەلکوو کارێ بکەین›.

**در حالی که**: ۱. لە کاتێکدا؛ لە کاتێدا؛ لە کاتێکا؛ لەو کاتەدا؛ لەو ئانەدا؛ چا وەختەنە؛ ژڤێ گاڤێدا؛ حالێوەنە ‹در حالی که می‌خندید گفت ...: لە کاتێکدا پێدەکەنی گوتی ...› ۲. کەچی؛ چی‌مەگیر؛ چی ئینە؛ چی مەکەرە؛ تەزمەکە؛ تومەس مەکە؛ تۆمەیژە ‹... در حالی که دروغ می‌گفت: ... کەچی درۆی دەدەکرد›.

**در هر حال**: هەر چۆنێ بێ؛ هەر چۆنێک بێت؛ بە هەر جۆر؛ هەچی بۆ؛ هەرچێو بۆ؛ لە هەر بار و دۆخێ کە هەیە ‹در هر حال این حرف درست نیست: هەر چۆنی بێ ئەم قسە ڕاست نیە›.

▣ **حال آمدن**: بووژانەوە؛ ژووژانەوە؛ ژیانەوە؛ هاتنەوە سەر حال؛ ئامەیوە پوێرە ‹یک استکان قنداغ دادم خورد، کمی حال آمد: پیالەیەک قەنداخم پێ دا، تۆزێ بووژایەوە›. هەروەها: **حال آوردن**

**حال دادن**: *[گفتاری]* کەیف دان؛ چەسپان ‹توی این گرما شنا خیلی حال می‌دهد: لەم گەرمایەدا مەلە زۆر کەیف دەدا›.

**حال کاری را داشتن**: لەشی کارێ هەبوون؛ بۆ ئەنجامدانی کارێک هۆگر و ئامادە بوون ‹حال هیچ کاری را ندارم: لەشی هیچ کارێکم نیە›.

**حال کردن**: خۆش ڕابواردن؛ ڕابواردن؛ ویاردەی؛ وەش بەردەی؛ کەیف‌کردن ‹آن شب حسابی حال کردیم: ئەو شەوە زۆر خۆشمان ڕابوارد›.

**حال کسی به هم خوردن**: ۱. حالی کەسێ تێکچوون؛ دلی کەسێ هەلشێویان؛ حالوو یۆی تێکشیەی؛ هێلنج دان و تووشی سەرگێژە و زاف هاتن ۲. *[کنایی]* بێز لێ هاتنەوە؛ قیز لێ شێویانەوە؛ دل لێ تێکچوون؛ زێل شیویەیوە چنەی؛ تووشی بێزاری و قینی زۆر بوون.

**حال کسی جا آمدن**: ۱. هاتنەوە سەر خۆ؛ حالی کەسێ هاتنە سەر خۆ؛ گەڕانەوە بۆ دۆخی سروشتی خۆ؛ ئامایوە سەروو وێ ‹یک هفته طول کشید تا حال مادرم جا آمد: حەوتەیەکی خایاند تا دایکم هاتەوە سەر خۆ› ۲. *[تعریض]* بزانێ عەلی کوڕکێیە؛ سزا دیتن؛ جزیا دیتن ‹چند ماه که توی زندان بخوابی، حالت جا می‌آید: چەند مانگ کە لە بەندیخانە بی، نەزانی عەلی کوڕ کێیە›.

**حال کسی را پرسیدن**: هەوالی کەسێ پرسین؛ لە حالی کەسێ پرسین؛ لە حال و بال و بار و دۆخی ژیانی کەسێ پرسین ‹زنگ زدم حال دایی را پرسیدم: زەنگم لێدا هەوالی خالم پرسی›.

**حال کسی را جا آوردن**: *[کنایی]* کەسێک بێراز/ گاوەسەرکردن؛ تیمارکردنی کەسێک؛ کەسێ تەمێ کردن یان خراپ لێ تووڕە بوون.

**حال کسی را گرفتن**: *[مجازی]* کەسێ بێزارکردن؛ پەژمراندن ‹امروز معلم جبر حالم را گرفت: ئەمڕۆ مامۆستای جەبرەکەمان بێزاری کردم›.

**حال نداشتن**: *[مجازی]* لە سەر خۆ نەبوون؛ بێ‌لەش بوون؛ تووشی نەخۆشی و بێ‌حالی بوون ‹دیشب حال نداشتم، تا صبح خوابم نبرد: دوێنێ‌شەو لە سەر خۆم نەبووم، تا بەیانی خەوم لێ‌نەکەوت›.

**حال و احوال کردن**: چاک و خۆشی کردن؛ هەوالپرسی‌کردن؛ حالی کەسێ پرسین؛ خوەش و بێش‌کردن؛ وەشی و تشی‌کەردەی ‹دیروز تلفنی حال و احوال کردیم: دوێنێ بە تەلەفوون چاک و خۆشیمان کرد›.

از حال رفتن: بوورانه‌وه؛ له سەر خۆ چوون؛ چ وێشیەی؛ ویەردەیوە؛ لە هۆش چوون ‹از خستگی و گرسنگی از حال رفتم: له بەر ماندوویەتی و برسیەتی بوورامەوە›.

به حال خود رها/ ول کردن: پایەی نەبوون؛ ئاوڕ لێ نەدانەوە؛ هەر وا وێڵ کردن؛ داخستن. هەروەها: **به حال خود گذاشتن**

درحال کاری بودن: سەرقاڵی کارێ بوون؛ خەریکی کارێ بوون ‹در حال نوشتن بودم که یکی زنگ زد: سەرقاڵی نووسین بووم یەکێک لە زەنگی دا›.

**حال**[2] *قید.[ادبی]* ئێستە؛ ئێستا؛ ئێستێ؛ ئیسە ‹حال باید بروند: ئێستە دەبێ بڕۆن›.

**حالا**[1] / hālā/: [عربی]/*اسم.* ئێستە؛ ئێستا؛ ئێستێ؛ ئێستەکێ؛ ئیسە؛ ئایسە؛ پسا؛ ڤێگا؛ ڤێگاڤێ؛ نهۆ؛ نها؛ نووکە؛ هەنووکە؛ نووە ‹تا حالا او را ندیده‌ام: تا ئێستێ نەمدیووە›.

**حالا**[2]: *قید.* ئێستە؛ ئێستا؛ ئێستێ؛ ئێستەکێ؛ ئیسە؛ پسا؛ ڤێگا؛ ڤێگاڤێ؛ نهۆ؛ نها؛ نووکە؛ نووە؛ لەو کات و ساتەی وا تێیداین ‹حالا می‌خواهم بروم: ئێستا ئەمەوێ بڕۆم›.

**حالا**[3]: *حرف.* ئێستە؛ ئێستێ؛ ئێستا؛ ئیسە: ۱. دیسان؛ دیسانەکە؛ بەم حاڵەشەوە ‹حالا خوب است پات نشکسته: دیسان زۆر باشە پات نەشکاوە› ۲. ئەمجار؛ ئیجا؛ ئینجا ‹تو سعی خودت را بکن حالا بشود یا نشود: تۆ کاری خۆت بکە ئێستە ببێ یان نەبێ› ۳. ئەگەر؛ ئەگە؛ هەگە؛ ئەر ‹من می‌گویم می‌آید، حالا نیامد هم نیامد!: من دەڵێم دێ، ئێستا نەشهات چش!›.

**حالا**[4]: *صوت.[گفتاری]* ۱. ئێستە؛ ئێستێ؛ ئێستا؛ ئیسە؛ وشەی خوایشت و ئاگادار کردنەوە ‹حالا تو کوتاه بیا: ئێستە تۆ دەس هەڵگرە› ۲. ڕاوەستە؛ بێسە؛ بێستە؛ بوێسە؛ مدرە؛ وشەی ترساندن ‹حالا ببین چه بلایی سرت می‌آورم: ڕاوەستە بزانە چیت بەسەر بێنم›.

**حالات** / hālāt/: [عربی] جمعِ ☜ **حالَت**

**حالاـحالا** / hālāhālā/: [عربی] *قید.[گفتاری]* جارێ؛ جارێکان؛ جارێو؛ جاریە؛ هێشتا؛ هەڵەی؛ هێما؛ هالەکوێ ‹حالاـحالا کار دارد: جارێ کاری ماوە›: **حالاـحالاها**

**حالاـحالاها** / hālāhālāhā/: [عربی/ فارسی] ☜ **حالاـحالا**

**حالب** / hāleb/: [عربی]/*اسم.[پزشکی]* میزڕێ؛ میزەڕۆ؛ هێلۆق؛ لوولەی تەنک و باریکی ڕێ داچۆڕانی میز لە گورچیلەوە بۆ میزدان.

**حالت** / hālat، ـها؛ حالات/: [عربی]/*اسم.* بار: ۱. دۆخ؛ چۆنیەتی؛ چۆنەتی؛ چەینیەتی؛ چۆناوچۆنی؛ چۆنایەتی؛ چەینە و چەینی؛ لۆر؛ حالەت؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی شتێ ‹حالت نشستن: باری دانیشتن› ۲. دۆخ؛ لۆر؛ چۆنیەتی بار و دۆخی ڕۆحی ‹دیروز حالت گرفته‌ای داشت: دوێنێ بارێکی داگیراوی بوو› ۳. لۆر؛ لەون؛ دۆخ یان ئاستی فیزیکی ‹حالت جامد: باری خۆگر› ٤. لەبار؛ بە هەست ‹صدای گوینده خیلی با حالت بود: دەنگی وێژەر زۆر لەبار بوو›.

**حال‌گیری** / hālgîrî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* *[گفتاری، مجازی]* کار یان ئاکاری سەر و دڵ گرتن؛ لە گۆ بردنەوە؛ ئازار دان و تووڕەکردنی کەسێ.

**حال‌ندار** / hālnadār/: [عربی/ فارسی] *صفت.* *[گفتاری]* نەخۆش؛ نەوەش؛ ناساغ؛ دەغەزدار؛ دەغەزار ‹دفعه‌ی آخر که او را دیدم حال‌ندار بود: ئاخر جار کە دیتم نەخۆش بوو›. هەروەها: **حال‌نداری**

**حال‌وحوصله** / hāl-o-ho:sele, -howsale/: [عربی]/*اسم.[گفتاری]* دەس و دڵ؛ گورد و هۆگر، بەتایبەت بۆ ئەنجامدانی کارێ ‹دیگر حال و حوصله‌ی هیچ کاری را نداشت: ئیدی دەس و دڵی هیچ کارێکی نەبوو›.

**حال و روز** / hāl-o- rûz/: [عربی/ فارسی] /اسم. [گفتاری] ڕۆژگار؛ ڕۆژ و ڕۆژگار؛ ڕەنگ و ڕوو؛ حاڵ و ڕۆژ؛ حـاڵ و ڕۆژگـار؛ حـاڵ و ڕۆ ‹وقتـی از اداره اخراج شد حال و روز بدی داشت: کاتێ لـه مەزرینگـه دەرکرا ڕۆژگارێکی شڕی بوو›.

**حـال و هـوا** / hāl-o-havā/: [عربـی] /اسم. [گفتـاری] ۱. ڕەنـگ و بـۆ؛ ڕەنـگ و ڕوو؛ دۆخ یـان بـاری بـەر و بوومێـک بـە ڕەچـاوکردنی ئـەو کارتێکەریـەی کـە لـە سـەر مێـشکەوە دایـدەنێ ‹شـهر حـال و هـوای روزهـای عیـد را داشـت: شـار ڕەنـگ و بـۆی ڕۆژانی جێـژنی بـوو› ۲. بار؛ بـار و دۆخـی کەسـێ ‹امـروز در چـه حـال و هوایی هستی: ئەوڕۆ لە چ بارێکدای؟›.

**حالی** / hālî/: [عربی] صفت. [گفتاری] حاڵی؛ ئاگـا؛ هاگا؛ تێگەیـشتوو ‹پـس از اینکـه مـدتی حـرف زدم آخرش حالی شـد مـی‌خـواهم قرضـش را بـدهم: پـاش ئـەوەی هێنـدێک قـسەم کـرد دوایـی حالـی بـوو دەمەوێ قەرزەکەی بدەمەوە›.

▣ **حالی به حالی شدن:** [گفتاری] حاڵ گۆڕان؛ ئی دیم و ئەو دیم بیەی؛ گۆڕانی حاڵ، بە تایبەت بە هۆی خۆشحاڵی و خۆشی زۆرەوە ‹بـا دیـدن آن همه پول، حالی بـه حـالی شـد: کـه چـاوی بـەو هەمکە پارەیە کەوت، حالی گۆڕا›.

**حـالی شـدن:** تێگەیـشتن؛ ئەنـەیاوەی؛ فێـر بوون؛ حاڵی بوون. هەروەها: **حالی کردن**

**حامـل**[1] / hāmel/: [عربـی] /اسم. [موسـیقی] خـط حامل ☜ **خط**

**حامـل**[2]: صفت. ۱. هەڵـگر؛ چۆنیـەتی پێبـوون؛ هەڵگرتن ‹کشتی حامل گندم بود: گەمیەکە گـەنمی پێبوو› ۲. ڕاگوێز؛ هێنەر ‹حامل چـک؛ حامـل پیام: هێنەری چەک؛ ڕاگوێزی پەیام›.

▣ **حامل رأس‌الغول** ☜ **بَرساوُش**

**حاملگی** / hāmelegî ، ـها/: [عربـی/ فارسـی] /اسم. ئاوسی؛ ئاڤسی؛ سکپڕی؛ زکپڕی؛ لەمەپڕی؛ دوو گیانی ‹دوران حاملگی: دەورانی ئاوسی›.

**حاملـه** / hāmele ، ـهـا/: [عربـی] صفت. ئـاوس؛ ئاڤس؛ سکپڕ؛ زگپڕ؛ لەمەپڕ؛ دووگیان؛ دوەگیان ‹عروسش حامله است: بووکەکەی ئاوسە›.

**حامی**[1] / hāmî/: /اسم. حامی: ۱. ـها؛ ـان/ هـەر یەکە لە خەڵکی نژادی سپی پێستی نیشتەجێ باکووری ئافریقا ۲. لقێ لـە زمانگـەلی بـاکووری ئافریقا، بریتی لە قەفتی، بەربەر و کووشی.

**حـامی**[2] / ـهـا؛ ـان/: [عربـی] صـفت. پـشتیوان؛ پشتیبان؛ یاریدەر؛ پارێزەر ‹حامی صلح: پشتیوانـی ئاشتی›.

**حاوی** / hāvî/: [عربی] صفت. لـەخۆگر؛ هەڤـبەر؛ هەڵگر؛ خاوەن شتێ لە ناو خۆیـدا ‹کیـف حـاوی پول: کیفی لەخۆگری پارە›.

**حایز** / hāyez ، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. خاوەن؛ بە دەس هێنـەر ‹حـایز مقـام اول: خاوەنـی پلـەی یەکەم›: **حائز**

▣ **حایز اکثریت:** خاوەنی زۆربەیی/ زۆرینـە؛ بـە دەس هێنـەری زۆرتـرین ڕا، ئەنـدام یـان لایەنگر.

**حایض** / hāyez/: [عربی] صفت. پـۆنی؛ مـەهک؛ بێنوێژ؛ ژنی تووشیاری نەخۆشی مانگانە: **حائض**

**حایل** / hāyel/: [عربی] صفت. لەمپـەر؛ پـەرژین؛ پەرچین؛ گەپل؛ جوێ کەرەوەی دوو یان چەنـد شـت لـە یـەکتری، بـە هـۆی هەڵـکەوتن لـە نێوانیاندا ‹صفی از گلها بین ما حایل بود: ڕیزێـک لـە گوڵ لە نێوانمان لەمپـەر بـوو›: **حائـل**. هـەروەها: **حایل بودن؛ حایل شدن**

**حـب** / hab(b) ، ـهـا/: [عربـی] /اسم. [قـدیمی] ۱. حوب؛ حـەب؛ قورسـی دەرمـان؛ گزمووڵـەی دەرمان ۲. توو؛ تۆم؛ ڕژک؛ قل؛ دەنک؛ دەندک؛ دان یان تۆمی ڕووەک.

▣ **حب جیم خوردن** ☜ جیم شدن، **جیم**

**حب** / hob(b)/: [عربی] /اسم. [ادبی] خۆشەویستی؛ خۆشەویـسی؛ خوەشەویـسی؛ وەشەویـسی؛ وەشەسـیایێ؛ ڤـیان؛ ویـان؛ دۆسـتی؛ دۆسـی؛

گەرەکی؛ مێر؛ میهر ‹حب مقام: خۆشەویستی دەسەڵاتداری›.

▣ **حب وطن:** خۆشەویستی نیشتمان.

**حباب** / hobāb ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ١. تۆقلە؛ گومەزە؛ بلق؛ بۆفره؛ هەک؛ پەقویشک؛ پەقیشک؛ پەقژ؛ تەقلە؛ گلۆپە؛ گۆیژەی هولۆلی نێو تراو ‹حباب صابون: توقلەی سابوون› ٢. گوێزە؛ گوێزوو؛ کلاوەیەکی ناو خالی لە شووشە یان چینی لە سەر برێ گلۆپەوە.

**حبابچه** / hobābče ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* پەقژک؛ تۆقلەک؛ گۆیزە؛ بلقەک؛ بلقیژە؛ تەقلۆکە؛ گومەزەک؛ گومەزەل؛ بلقیلە؛ گلۆپچە: **حبابک**

**حبابک** / hobābak ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ١. ☜ **حبابچه** ٢. *[زیست‌شناسی]* هەر یەکە لە کیسە وردەکانی نێو سی بڕبڕەداران.

**حبس** [١] / habs ، ـها/: [عربی]/*اسم. [گفتاری]* بەندیخانە؛ گرتووخانە؛ زینان؛ زیندان؛ بەند ‹چهار سال توی حبس بود: چوار سالان لە بەندیخانە بوو›.

▣ **حبس ابد:** *[حقوق]* بەندی هەتا هەتایی؛ زیندانی تا برانەوەی ژیان.

**حبس انفرادی:** سلوول؛ بەندی تاکەکەسی؛ زیندانی بە تەنیا لە ژوورێکدا: **حبس مجرد**

**حبس با اعمال شاقه:** بەند بە کارەوە؛ لە زیندان هاورێ لەگەڵ کاری دژواردا.

**حبس بول:** میزبەند؛ ئەوبەن؛ نەخۆشی کۆ بوونەوەی میز لە میزداندا و نەڕژانە دەری.

**حبس تأدیبی:** زیندانی لە ڕۆژێکەوە تا سێ ساڵ.

**حبس تعزیری:** زیندان بۆ تەمێ کردن.

**حبس تعلیقی:** جۆرێ زیندان، کە بە سەرهەڵدانی تاوانێکی تر بە ڕێوە دەچێ.

**حبس تکدیری:** زیندانی کەم خایەن لە دوو تا دە ڕۆژ کە بۆ سەندن دەبێ.

**حبس مجرد** ☜ **حبس انفرادی**

**حبس** [٢]: *صفت. [گفتاری]* بەندی؛ گراو؛ زیندانی؛ زینانی ‹چهار سال توی کرج حبس بود: چوار ساڵ لە کەرەج بەندی بوو›.

**حبسی** / habsî ، ـها/: [عربی] *صفت. [گفتاری]* بەندی؛ گراو؛ زیندانی؛ زینانی.

**حبسیات** / habsîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **حبسیه**

**حبسیه** / habsîyye ، ـها؛ حبسیّات/: [عربی]/*اسم.* بەندی‌نامە؛ بەندییە؛ هەڵبەستێ کە شاعیر لە زینداندا و نەخوازا لە بارەی دیل بوونی خۆی یان بار و دۆخی بەندیخانەوە هۆنیویەتەوە.

**حبشی** [١] / habašî ، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم.* حەبەشی؛ هەر کەسە لە خەڵکی حەبەشە (ئێتیۆپی).

**حبشی** [٢]: *صفت.* حەبەشی؛ ئێتیۆپیایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە حەبەشەوە.

**حبوبات** / hobûbāt, hubûbāt/: [عربی]/*اسم.* خەلە؛ دانەوێڵە؛ خەلە و خەرمان؛ دەخڵ‌ودان؛ دەرکەدوو؛ هیش؛ بەهرەی زەمین لە دانەوێڵە.

**حبه** / habbe ، ـها/: [عربی]/*اسم.* کولۆ؛ کلۆ؛ کولە؛ گومتل؛ دانە؛ هەڤە؛ هەپە؛ هەب؛ دەنک؛ دەنکە؛ بۆڵ؛ پلووک؛ گلار؛ گلارە؛ گلێ.

▣ **حبه کردن:** دانار کردن؛ دانەدانەکردن؛ دەنک‌ـدەنک کردن؛ گلەکردن.

**حبه‌ای** / habbe'î/: [عربی] *صفت.* کولۆیی؛ کلۆیی؛ کولۆینە؛ گۆمتلی؛ وەکوو کولۆ ‹قند حبه‌ای: قەندی کولۆیی›.

**حبیب** / habîb ، ـان؛ احباب/: [عربی]/*اسم.* خۆشەویست؛ خوەشەویس؛ وەشەویس؛ خۆشتڤی؛ ئازیز.

**حتا** / hatta/: [عربی] ☜ **حَتّی**

**حتم** [١] / hatm/: [عربی] *صفت.* بێ گومان؛ بێ شک؛ حەتم ‹به طور حتم آنجا نیست: بێ گومان لەوێ نیه›.

**حتم** [٢]: *قید. [گفتاری]* بێ شک؛ دڵنیا؛ بە دڵنیایی

‹حتم که برمی‌گردد: بێ‌شک دێتەوە›.
◘ **حتم داشتن:** بێ‌گومان بوون؛ بێ‌شک بوون؛ دڵنیا بوون ‹حتم داشت که برنده می‌شود: بێ‌گومان بوو دەیباتەوە›.
**حتماً** / hatman/: [عربی] *قید.* بێ‌گومان؛ بێ‌سۆ؛ بێ‌ڕوێز؛ بێ ئەولا و لا؛ ژبن؛ هاینە؛ هەم؛ هەر؛ ئیزدەرم؛ ئیزتەرەم ‹حتماً می‌آید: بێ‌گومان دێت›.
**حتمی**[1] / hatmî/: [عربی] *صفت.* مسەوگەر؛ مسۆگەر؛ شیاوی دڵنیایی لە بوونی شتێک یان ڕوودانی ‹سفر حتمی؛ پیروزی حتمی: سەفەری مسەوگەر؛ سەرکەوتنی مسۆگەر›.
**حتمی**[2]: *قید. [گفتاری]* بێ‌گومان؛ بێ‌ئەولا و لا؛ ژبن؛ هاینە؛ هەم؛ هەر؛ ئیزدەرم؛ حەتمەن ‹حتمی باید بروی: بێ‌گومان ئەبێ بڕۆی›.
**حتمیت** / hatmîyyat/: [عربی] *اسم.* دۆخ یان چۆنیەتی مسەوگەر بوون ‹حتمیت آن کار فعلاً معلوم نیست: مسەوگەر بوونی ئەو کارە جارێک دیار نیە›.
**حتی** / hattā/: [عربی] *حرف.* تەنانەت؛ تەنانە؛ حەتتا؛ هەتا؛ هەیا؛ تەور؛ هەم؛ تا: ۱. زیاتر لەوە ‹حتی حاضر شد پول بیشتری هم بدهد: تەنانەت ئامادەیش بوو پارەیەکی زیاتر بدا› ۲. زیاتر لەوانی دیکە ‹حتی تو هم رفتی: تەنانەت تۆیش ڕۆیشتی› ۳. وشەی پێداگری لە سەر توندی شتێ ‹حتی نگاهش هم نکرد: تەنانەت تەمەشایشی نەکرد› ❋ **حتّا**
**حتی‌الامکان** / hattalemkān/: [عربی] *قید.* تا ئەوجێ دەکرێ؛ تا دەکرێ/ دەلوێ/ دەبێ؛ تا بلوێ؛ تا بشێ؛ تا دەتوانرێ؛ تا ئەو جێگە ڕێگەی هەبێ؛ بە گوێرەی توانا ‹حتی‌الامکان به او کمک کنید: تا ئەوجێ دەکرێ یارمەتی بدەن›.
**حتی‌المقدور** / hattalmaqdûr/: [عربی] *قید.* تا ئەوجێ دەکرێ؛ تا بکرێ؛ هەتا کریۆ؛ تا بلوێ؛ بە گوێرەی دەستەڵات ‹حتی‌المقدور خوب درس بخوان: تا ئەوجێ دەکرێ باش دەرس بخوێنە›.
**حج** / hac(c)/: [عربی] *اسم.* حەج؛ داب و نەریتی زیارەتی کابە لە باژێری مەککەدا.
◘ **حج تمتّع:** حەجی تەمەتتوع؛ حەج لە دە ڕۆژی هەوەڵی زیحەجەدا.
**حج عمره:** حەجی عومرە؛ حەجی جگە لە دە ڕۆژی هەوەڵی زیحەجە.
◘ **حج رفتن:** حەج‌کردن؛ چوونە حەج؛ چوونە زیارەتی ماڵی خوا ‹پارسال رفتیم حج: پارەکە حەجمان کرد›.
**حج گزادن:** حەج‌کردن؛ زیارەت کردنی کابە.
**حجاب** / hecāb ، ـها/: [عربی] *اسم.* ۱. پەردە؛ ئەوەی کە شتێ دادەپۆشێ و بەری دیتنی دەگرێ ۲. ڕووگر؛ پۆشەر؛ داپۆشەر؛ ئەوەی کە سەر و چاوی ژنان دادەپۆشێ (وەکوو چارشێو).
◘ **حجاب حاجز:** *[کالبدشناسی]* دیافراگم؛ پەردەی نێوان سینگ و گەدە کە کاتی هەناسەدان بان و خوار دەکا.
**حجاج** / hoccāc/: [عربی] جمعِ ☜ **حاجی**
**حجار** / haccār ، ـان/: [عربی] *اسم. [ادبی]* بەردتاش؛ تەوەن‌تاش؛ بەردبڕ؛ بەربڕ.
**حجاری** / haccārî ، ـها/: [عربی] *اسم.* ۱. بەردتاشی؛ تەوەن‌تاشی؛ بەردبڕی؛ بەربڕی ۲. هەڵقەندراو؛ هەڵکۆڵراو؛ هەڵکۆشیاگ؛ هەڵکەندراو لە سەر بەرد.
**حجاز** / hecāz/: [عربی] *اسم.* حجاز؛ لە قامگەلی مووسیقای ئێرانی.
**حجام** / haccām/: [عربی] *اسم. [ادبی]* خوێنگیر؛ حەجامەت‌کێش؛ خوێن بەردەر؛ کووزکڤان؛ وەستای خوێن بەردەر.
**حجامت** / hacāmat/: [عربی] *اسم.* خوێنگری؛ حەجامەت؛ هەجامات؛ دووژ؛ ڕکەنە؛ جۆرێ کاری خوێن‌گرتن بە بڕینی بەشێ لە پێستی ناوشان و هەڵمژینی خوێنەکەی بە کەڵەشاخ.
**حجب** / hocb/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ڕوونەرمی؛ کەمڕوویی؛ شەرمنی؛ شەرمێونی؛ شەرم؛ حەیا ‹از فرط حجب نتوانست مقصودش را بیان کند: لە بەر

ڕووندەرمی زۆر نەیتوانی مەبەستی خۆی دەربڕێ›.

**حجـب و حیـا** / hocb-o-hayā/: [عربـی]/اسـم. [گفتـاری] شـەرم و شـوورەیی؛ شـەرم و حـەیا: ۱. حەیا؛ حیا؛ فەدی؛ فهێـت؛ شـەرم و ڕوو ‹زن! حجب و حیایت کجا رفته؟: ژنەکە! شەرم و شوورەییت کوانێ؟› ۲. ئەدەب؛ شەرم ‹حجب و حیا نمی‌گـذارد همه چیز را بگویم: شەرم و شوورەیی ڕێ نادا هـەموو شتێک بێژم›.

**حجت** / hoccat ، ـها/: [عربی]/اسـم. بەڵـگە؛ هـۆ؛ پڕنۆ؛ پاژ؛ پاژە؛ بەڵسا؛ دەلیل.

▣ **حجـــت آوردن:** بەڵـــگە هێنانـــەوە؛ هـــۆ هاوردنەوە.

**حجت بودن:** بەڵگە بوون؛ دەلیل بـوون؛ جـێ پەژیرانی بێ سێ‌ودوو بوون.

**حجت تمام کردن:** بڕانـەوە؛ بڕینـەوە؛ قسەی ئاخرکردن و کۆتایی هێنان بە باسێک.

**حجـــت‌الاســـلام** / hoccatoleslām ، ـهـــا؛ حجج‌اسلام/: [عربی]/اسم. [شیعه] حوجـەتول‌ئیـسلام؛ سەرناوێکی مامۆسـتایانی شـێعەیە، خـوارتر لـە ئایەتوڵڵا.

**حجج‌اسلام** / hocac'eslām/: [عربی] جمـعِ ☜ **حجت‌الاسلام**

**حجر** / hacar ، احجار/: [عربـی]/اسـم. [ادبی] بـەرد؛ بەر؛ تەوەن؛ تەوەنی؛ تونی؛ کوچک؛ کەڤر.

▣ **حجر فلاسفه:** بـەردی فەیلـەسووفان؛ فەیلـە بـەرد؛ بـەرد یـان مـاکێکی خەیاڵـی کـە پێیـان وابـوو دەتوانـێ کـانزای بـێبایـەخ بکاتە زێڕ.

**حجرات** / hocarāt/: [عربی] جمعِ ☜ **حجره**

**حجره** / hocre ، ـها؛ حجرات/: [عربی]/اسم. حوجرە: ۱. ژووری مزگەوت بۆ فەقێ ۲. دەفتەری کاری بازرگان لە بازاڕدا.

**حجلـه** / hecle ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ۱. پـەردە؛ پەردوو؛ چیـت‌جـا؛ چیتـەجا؛ دیـوی نووسـتنی بووک و زاوا ۲. خانۆکەیەکی چکۆلەی داپۆشـراو لە ئاوێنە و چرا کە لە وڵاتی عەجـەم، بـە یـادی مردوویەکی جوانەمەرگ (زۆرتـر پیـاو) لـە سـەر ڕێگایان دایدەنێن.

▣ **حجلـه بـستن:** پـەردە سـازدان؛ پـەردوو دروست‌کردن.

**حجـــم** / hacm ، ـهـا؛ احجـام/: [عربـی]/اسـم. بارســـتایی؛ بارســـت: ۱. قـــەوارە؛ قـــەبارە؛ شـاقەل؛ هەنـدی ئـەو بۆشـاییە کـە تـەنێکی سێ‌پاڵـوو دایـدەگرێ ‹حجـم ایـن مکعـب را پیـدا کنیـد: بارســـتایی ئـەم چوارپاڵـووە بدۆزنـەوە› ۲. [مجـازی] هەنـد؛ چەنـد؛ گـرانی؛ گۆرەبـا؛ گوژمە ‹حجم کار: بارستی کار›.

▣ **حجم مخصوص** ☜ **حجم ویژه**

**حجم ملکولی:** [شیمی] بارسـتایی مولوکـوولی؛ بارستایی تاقە مولوکوولێکی هەر ماکێک.

**حجـم ویـژه:** [شـیمی] بارسـتایی تایبـەت؛ بارستایی یەک گرەم لە هەر ماکێک لە دەما و گوشاری دیاریکراودا: **حجم مخصوص**

**حجم‌سنج** / hacmsanc ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. بارست‌پێو: ۱. ئامرازێک بۆ پێوانی دێرانی دەفر، چاڵ و ... ۲. ئامرازی پێوانی بارستی ئەوەی کە لە نێو دەفر یان چاڵێکدایە.

**حجمـی** / hacmî/: [عربـی] صـفت. بارسـتی؛ پێوەندیدار یـان سـەر بـە بارسـت ‹وزن حجمـی: کێشی بارستی›.

**حجیم** / hacîm/: [عربی] صفت. [ادبی] بەبارسـت؛ گەورە؛ بارستدار؛ بەقـەوارە؛ قـەوارەدار؛ خـاوەن بارستایی زۆر ‹صندوق حجیم؛ کتاب حجیم: سنووقی بەبارست؛ کتێبی گەورە›.

**حد** / had(d) ، ـهـا؛ حـدود/: [عربـی]/اسـم. ۱. ڕادە؛ پەرەسە؛ لانی؛ ئەندازە؛ گۆرە؛ شۆ؛ هەند؛ گۆرەبـا ‹بیش از حد: لە ڕادە بەدەر› ۲. سـنوور؛ کەوشـەن ‹حد شرقی آن منتهی می‌شود به خیابان: سـنووری لای ڕۆژهەڵاتی ئەگاتە شەقام› ۳. [اسلام] حەد؛ جزیای گوناهێک کە چۆنیەتیەکەی دیـاری کـراوە ‹حـد

شرعی: حەدی شەرعی› ٤. *[ریاضی]* لیمیت؛ ڕادە.
◘ **حد اشباع:** ڕادەی تێری/ تەسەلی/ پڕی؛ هەندی تەژەیی؛ گۆڕەی گۆزاوی؛ ڕادەیەک کە دەفر زۆرتر لەوە نەدیرێ یان هەڵنەگرێ.
**حداقلّ:** ١. لانی‌کەم؛ لای‌کەم؛ هیچ نەبێ؛ هیچ نەوێ؛ کیمیقە؛ ژقەنقە؛ قەنا؛ کەمی‌کەم ‹حداقل میبایست تلفن می‌زدی: لانی کەم دەبوو تەلەفوون بکەی› ٢. کەمترین؛ کەمترین ڕادە ‹حداقل دستمزد را می‌گرفت: کەمترین مووچەی وەردەگرت›.
**حداکثر:** ئەوپەڕ؛ لانی زۆر؛ لای زۆر؛ زۆرترین؛ زۆرترین هەند ‹حداکثر توانایی: ئەوپەڕی دەستەلات›.
**حد امکان:** ڕادەی برشت؛ ڕادەی لوان/ بۆلوان.
**حد اَوسط** ☜ **حد وسط**
**حد بلوغ:** پەرەسەی پێ‌گەیشتن؛ تەمەنی پێ‌گەیشتن؛ پەرەسەی پەرفین؛ ڕادەی بلۆق.
هەروەها: **حدّ رشد**
**حد تکلیف:** *[اسلام]* پەرەسەی تێگەیشتن؛ تەمەنێ کە ئەنجامدانی فەرمانی شەرع (وەک نوێژ و ڕۆژوو) دەبێتە ئەرک.
**حد فاصل:** کەوشەن؛ سنوور؛ ڕادەی جیا کەرەوە؛ هێڵی نێوان دوو یان چەن شت.
**حد نصاب:** پەرەسەی نیاز؛ ڕادەی پێویست؛ ڕادەیێک کە بۆ پێ‌گەیشتن بە کاری ڕەچاوکراو پێویستە.
**حد وسط:** مامناونجی؛ مامناوندی؛ مام ناوەندی؛ هەندی ناوەند؛ ڕادەی ناوەڕاست؛ بەینی زۆر و کەم: **حدّ اَوسط**
◘ **حد زدن:** حەد لێدان؛ بە جەزیای شەرعی گەیاندنی گوناهکار.
**از حد گذشتن:** لە ڕادە دەرچوون؛ لە تام دەرکردن؛ لە کەوشەن ترازان؛ لە سنوور لادان/ تێپەڕان؛ مەزرەنە ترازەی؛ جە شۆ بەرشیەی؛ لە ئەندازە دەرچوون ‹وقتی سختی زندگی از حد گذشت، مجبور به مهاجرت شدند: کاتێ دژواری ژیان لە ڕادە دەرچوو، ناچار بوون بارکەن›.

**حدت** / heddat /: [عربی] تیژی؛ توندی؛ تون و تیژی؛ دۆخ یان چۆنیەتی گژ و دژوار بوون ‹حدت سرما: تیژی سەرما›.
**حدس** / hads ، ـها؛ حدسیّات/: [عربی] اسم. سۆسە؛ مەرسە؛ مەنی؛ گومان؛ گێز؛ پێ؛ تێڕوانینێ وا کە بە پێی هۆ و بەڵگەوە نەبێ.
◘ **حدس زدن:** وا بۆچوون؛ بە خەیاڵ هەڵسەنگاندن/ بۆ چوون؛ قەبلاندن؛ قەرساندن ‹حدس زده بودم که بیاید: وای بۆ چووبووم بێ›.
**حدساً** / hadsan /: (!) [عربی] *قید*. بە گومان؛سۆسەیی؛ لە ڕووی سۆ و گومانەوە ‹حدساً می‌خواست من را امتحان کند: بە گومان دەیویست من تاقی بکاتەوە›.
**حدسی** / hadsî /: [عربی] *قید. [گفتاری]* سۆسەیی؛ بە گومان ‹حدسی گفتم: سۆسەیی گوتم›.
**حدسیات** / hadsîyyāt /: [عربی] جمعِ ☜ **حَدس**
**حدقه** / hadaqe ، ـها/: [عربی] *اسم*. کالانە؛ قۆقک؛ کاسەچاو؛ کالانە/ قاپیلکی چاو؛ جێ چاو؛ قوولکەی چاو؛ قووتەی چەمی.
**حدوث** / hudûs, hodûs /: [عربی] *اسم*. ڕەوتی ڕوودان؛ قۆمان؛ ڕوودەی: ١. چۆنیەتی ڕووداو بوون؛ پێش هاتن ٢. چۆنیەتی بەدیهاتن یا ڕوودان ‹حدوث جنگ: حدوث عالم: ڕوودانی شەڕ؛ بەدیهاتنی جیهان›.
**حدوحساب** / hadd-o-hesāb /: [عربی] *اسم*. *[گفتاری]* پەرەسە و ڕادە؛ هەند و شۆ؛ شۆ و هەژمار؛ شۆ و گۆڕە؛ ڕادە و گۆڕەبا؛ هەند و چەند.
**حدوحصر** / hadd-o-hasr /: [عربی] *اسم. [ادبی]* ئەندازە و سنوور؛ ڕادە و شۆ.
**حدود** / hudûd, hodûd /: [عربی] جمعِ ☜ **حَد**

**حـــدود** / hudûde, hodûde/: [عربـی] حـرف. *[گفتـاری]* نیزیـک؛ نزیـک؛ دەور؛ دەور و بـەر: ۱. نزیک بە چەنەتیەک ‹در حدود صد نفر بودند: نیزیک بە سەد کەس بـوون› ۲. لای؛ نیزیـک بـە جێگایەک ‹خانەشان حدود خیابان آبیدر بـود: مالـیان نیزیک شەقامی ئاویەر بوو› ***در حدودِ**

**حد و مرز** / hadd-o-marz/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئەوپـەڕ؛ سـەرو؛ سـنوور؛ نـاوەین؛ ئـاخر و جـێ برانەوەی هەر شتێک ‹حد و مرز خیابان معلوم نبـود: ئەوپەڕی شەقامەکە دیار نەبوو›.

**حــدیث** / hadîs، ـهـا؛ احادیـث/: [عربـی]/اسـم. ۱. *[اسـلام]* حـەدیس؛ قـسە، گوتـار یـان ڕێورەوشـتی پێغەمبـەری ئیـسلام ۲. *[ادبـی]* هەواڵ؛ وتار؛ خەبەر.

▣ **حـدیث نفـس**: *[ادبی]* بەسـەرهات؛ ژینامـەی خۆنـووس؛ وتـە یـان نووسـراوەیەک کـە ڕاگەیەنــەری بـار و دۆخ و سەرگوروشـتەی وێژەرە.

▣ **حدیث کـردن**: *[ادبی]* گـوتن؛ وتـن؛ واتـەی؛ کوتن؛ ئاخافتن؛ پەیڤین؛ قسە/ باس کردن.

**حدیث‌گفتن**: حەدیس وتن؛ حـەدیس گـوتن؛ لە بـارەی پێغەمبـەری ئیـسلامەوە قـسەیەک گەڕاندنەوە.

**حدیده** / hadîde، ـهـا/: [عربی]/اسم. حەدیـدە: ۱. خێڕی ڕووی دەرەوەی پێچ و سـەری لوولـە و... ۲. ئامرازی جێ پـێچ دەرهێنـان لـە سـەر لوولە و میلە و...

▣ **حدیـده کـردن**: حەدیـدەکردن؛ خێڕـخێڕ کردنی ڕووی دەرەوەی پـێچ و سـەری لوولـە و...

**حدیده کاری** /hadîdekārî/: [عربی/ فارسی]/اسم. حەدیدەکاری؛ کار یان ڕەوتی حەدیدەکردن.

**حذاقت** / hezāqat, hazāqat/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* پـسپۆڕی؛ شـارەزایی؛ شـەهرەزایی؛ وەسـتایی؛ هۆستایی؛ کارامەیی لە کار و پیـشە (بـە تایبـەت بزیشکی)دا.

**حــذر** / hazar/: [عربـی]/اسـم. *[ادبـی]* ۱. دووری؛ پـارێز؛ پـەرهێز؛ پـەرهیز؛ گـز؛ دوورەپـەرێزی ۲. *[نامتداول]* ترس؛ تەرسە؛ سام؛ باک.

▣ **حــذر کــردن**: دووری گــرتن؛ دوورەپــەرێزی کردن ‹همیشه از او حذر می‌کردم: هەمیـشە دوورم لێ دەگرت›.

**برحذر داشتن**: پرینگاندنـەوە؛ لـێ‌ترسـاندن و ڕێنوێنی کردن بۆ دووری لێ‌گرتن ‹پدرم مـرا از پرخوری بر حذر می‌داشت: بابم منی لـە فرەخـۆری دەپرینگاندەوە›.

**حذف** / hazf/: [عربی]/اسم. ۱. قت؛ فت؛ کار یان ڕەوتی لا بـردن و وەلا نـان ۲. *[بـدیع]* تـەرک؛ نـەهێنانی پیتێـک لـە شـیعر (وەکـوو ئـەوە کـە شیعرێک بێ خاڵ بێـت، یـان چەنـد پـیتی ئـەلف و بێتکەی تێدا نەبێ).

▣ **حذف کردن**: فت کردن؛ قت کردن؛ لا بردن؛ لاوردن؛ وەلانان؛ پەڕاندن؛ دەراوتین؛ لـە ڕیـز وەدەرنان؛ حەشفاندن؛ لێ برین/ قرتاندن.

**حذفی** / hazfî، ـهـا/: [عربـی] صفت. ۱. لابـراو؛ لابریاگ؛ قت‌کراو؛ لێ بـراو؛ فـت‌کـراو؛ لـێ بـڕاو ‹واژه‌های حـذفی را در جـای خودشـان بنویـسید: وشـە لابراوەکان لە جێگای خۆیاندا بنووسنەوە› ۲. شـیاو و لەبار بۆ قت‌وفت کردن.

**حرا** / herrā، ـها/: [عربی]/اسم. حەرا؛ دارێکـە لـە کنارێن و زەلکاودا دەڕوێ.

**حراج** / harrāc, harāc، ـها/: [عربی]/اسم. هەڕاج؛ حەڕاج؛ هەڕاژ؛ هـەڕراج: ۱. مـەزات؛ فرۆشـتنی شتێک بە فرەترین نرخی پێشنیارکراو لە لایـەن کریارانــەوە ۲. *[مجـازی]* فرۆشــتنی شـت بـە نرخێکی کەم.

▣ **حراج کردن**: هـەڕاج‌کـردن؛ حـەڕاج کـردن؛ شت فرۆشتن بە مەرجێ کێ پتری پێ‌بدا بـۆ ئەو بێ: **به حراج گذاشتن**

**به حراج گذاشتن** ☜ **حراج‌کردن**

**حراجـی** / harrācî,harācî ، ـها/: [عربـی]/اسـم. هەڕاجی؛ حەڕاجی؛ هەڕاژی: ١. جێگەیەک شت و کەلپەلی تێدا هـەڕاج دەکـەن ٢. کەسـێ کـە کاری هەڕاج کردنە.

**حرارت** / harārat/: [عربی]/اسم. ١. تین؛ گـەرما؛ گڕە؛ تن؛ تاو؛ چەشنێک وزەی پرشنگی کـە زۆر بوونی ئەبێتە هۆی گەرم بوونەوە و کـەم بـوونی ئەبێتە هۆی سارد بوونەوە ٢. /ـها/ ڕادەی تین و تاو ‹حرارت موتور خیلی زیاد است: گەرمای موتورەکـە یەکجار زۆرە› ٣. [مجازی] گڕ و تین؛ تـین و تـاو؛ گڕ و تاو ‹با حـرارت حـرف زدن: بـە گـڕوتین قـسە کردن›.

▣ **حرارت آتش:** کل؛ تینی ئاگر.

**حرارت اتمی** ☜ گرمای اتمی ، **گرما**

**حرارت احتراق** ☜ گرمای سوخت، **گرما**

**حرارت انحلال** ☜ گرمای انحلال، **گرما**

**حرارت تابشی** ☜ گرمای تابشی ، **گرما**

**حرارت تشکیل** ☜ گرمای تشکیل، **گرما**

**حرارت ذوب** ☜ گرمای ذوب، **گرما**

**حرارت سوخت** ☜ گرمای سوخت، **گرما**

**حرارت مخصوص** ☜ گرمای ویژه، **گرما**

**حرارت مرکزی** ☜ **شوفاژ**

**حرارت ملکولی** ☜ گرمای ملکولی، **گرما**

▣ **حرارت به خرج دادن:** [مجازی] گەرم و گوڕی نیشاندان؛ تـین و تـاو نوانـدن؛ کـەف و کـوڵ پیشاندان.

**حرارت دادن:** گەرم کردن/ کردنـەوە؛ گـەرما دان؛ تین پێدان؛ لە بەر گەرما دانان.

**حرارت داشـتن:** بـە تـین بـوون: ١. [مجـازی] بـەگـوڕ و تـین بـوون؛ گـەرموگـوڕ بـوون ٢. گەرم بوون؛ بە تین‌وتای زۆرەوە بوون.

**حرارت‌سنج** / harāratsanc ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. گەرماپێو؛ دەماپێو.

**حرارتی** / harāratî/: [عربی] صفت. ١. گـەرمایی؛ پێوەندیدار یان سەر بـە گـەرما ‹نیروی حرارتـی: هێزی گەرمایی› ٢. [گفتاری] بە گوڕ؛ بـە تـاو؛ بـە کوڵ؛ بە تین ‹در اول انقلاب، خیلی حرارتـی بـود: لـە سەرەتای ڕاپەڕیندا، زۆر بە گوڕ بوو›.

**حراسـت** / harāsat, herāsat/: [عربـی]/اسـم. ١. پاسەوانی؛ نواوانی؛ کار یان ڕەوتی پاراسـتن؛ پارازتن؛ بالدان ٢. /ـها/ ئاسـایش؛ بەشـێک لـە دامەزراوەیـەکی دەوڵـەتی کـە پاراسـتنی هێمنایەتی بە ئەستۆیە.

**حراف** / harrāf ، ـها/: [عربی] صفت. زمان‌لـووس؛ زوان‌چـەور؛ دەمـەوەر؛ زوانبـاز؛ خـاوەن توانـای هەڵـفریواندنی خەڵـک بـە قـسە ‹از آن آدمهـای چرب‌زبان و حراف است: لـەو بنیادەمـە چـەورزمان و زوانبازانەیە›.

**حرافـی** / harrāfî/: [عربـی]/اسم. زمـان‌لووسـی؛ زوانبـازی؛ دەمـەوەری؛ بـار و دۆخ و چۆنیـەتی زمان‌چەور بوون.

**حرام** / harām/: [عربی] صفت. ١. حەرام؛ نـاڕەوا؛ خەڵیم؛ قەدەغـە بـە فـەرمانی دیـن. بەرانبـەر: **حـلال** ‹ربـا حـرام اسـت: سـووخۆری حەرامـە› ٢. [گفتاری] خەسار؛ خراپ؛ خـراو؛ خـراب؛ زایـە ‹چرا اینهمه پارچه را حرام می‌کنی؟: بۆچی ئەم هـەموو پارچەیە خەسار دەکەی؟›.

**حرامخوار** / harāmxār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسـی] /اسم. حـەرامخۆر: ١. کەسـێ کـە خواردنـەوە و خۆراکی حەرام دەخوا ٢. کەسێ کە لە حەڵاڵ و حەرام ناپرسێ.

**حرامزادگـــــی** / harāmzādegî/: [عربــــی/ فارســی]/اسـم. حــەرامزادەیی؛ حــەرامزایی: ١. زۆڵـــی؛ زوێـــڵی؛ بێـــژی؛ پێژوویـــی؛ پیـــژی؛ ســـنۆتەیی؛ هــەزارڕەگی؛ دۆخ یــان چۆنیــەتی حـــەرامزادە بـــوون ٢. [کنـــایی] نادروســـتی؛ فێڵبازی؛ دەغەڵکاری.

**حرامـزاده** / harāmzāde ، ـها؛ ـگان/: [عربـی/ فارسی] صفت. حـەرامزادە؛ حـەرامزا؛ هەرامزایـە: ١. زۆڵ؛ زوێڵ؛ سـنۆتە؛ بیـژ؛ پیـژوو؛ پیـژ؛ بـیچ؛

پیج؛ پیچ؛ هەزار ڕەگ. بەرانبەر: **حلال‌زاده** ‹بچەی حرامزاده: منالی زول› ۲. *[کنایی]* نادرووس؛ فێڵباز؛ گزیکار؛ دەغەڵ ‹روباه خیلی حرامزاده است: ڕێوی زۆر حەرامزادەیە›.

**حرام‌گوشت** / harāmgûšt ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* حەرام‌گۆشت؛ تایبەتمەندی گۆشتێ کە خواردنی بە فەرمانی شەرع حەرامە. بەرانبەر: **حلال‌گوشت** ‹خوک حیوانی حرام‌گوشت است: بەراز حەیوانێکی حەرام‌گوشتە›.

**حرام‌لقمه** / harāmloqme ، ـها/: [عربی] *صفت.* تیکەحەرام؛ لە دایکێک کە ماڵی حەرامی خواردووە.

**حرام و حرص** / harām-o-haras/: [عربی] *صفت.* *[گفتاری]* خەسار؛ زایە؛ خراو؛ خەرا؛ بەفێرۆچوو.

⊡ **حرام و حرس کردن:** *[گفتاری]* لەکیس دان؛ بەبا دان؛ فەوتاندن؛ حەرام و تەرام کەردەی؛ بە فێڕۆ دان ‹آن همه پول را برد و حرام و حرس کرد: ئەو هەموو پارەی برد و لەکیسی دا›.

**حرامی** / harāmî ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* *[قدیمی]* چەتە؛ ڕێگر.

**حرب** / harb ، ـها/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* شەڕ؛ جەنگ. هەروەها: **حرب کردن؛ به حرب رفتن**

**حربا** / herbā/: [عربی] ☜ **آفتاب‌پرست**

**حربه** / harbe ، ـها/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* ۱. *[مجازی]* بەهانە؛ بیانوو؛ بیانک ‹تو نباید با این کارها حربه به دست دشمنانت بدهی: تۆ نابێ بەم کارانە بیانوو بدەیتە دەست نەیارانتەوە› ۲. *[نامتداول]* داردەس؛ داردەست؛ چەک؛ ئامرازی شەڕ.

**حربی** / harbî/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* شەڕانی؛ جەنگەرانی؛ شەرکەر ‹کافر حربی: کافری شەڕانی›.

**حرج** / harac/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* ۱. *[نامتداول]* ترس؛ تەرسی؛ سام؛ باک؛ بیم ۲. *[ادبی]* گلە؛ بەرتەک؛ بەرهەڵستی؛ ول- ول ‹اگر هم نیامدید بر شما حَرَجی نیست: ئەگەریش نەهاتن هیچ گلەیەکتان لەسەر نیە› ۳. *[ادبی]* تەنگانە؛ سەختی و دژواری ‹ایام جنگ سخت در حَرَج بودیم: کاتی شەڕ پیس کەوتبووینە تەنگانەوە›.

**حرز** / herz/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* نووشتە؛ نووشتی؛ نووشتوو؛ نشتوو؛ نڤرشت؛ نڤشتی؛ نڤشتۆک؛ نڤشت؛ دوعای نووسراو بۆ لابردنی ئازار و ئافەت.

**حرص** / hers/: [عربی] *اسم.* ۱. هەڵپە؛ هەڵپ؛ چڵ؛ گز؛ مەیلی زۆر بۆ بە دەس هێنانی شتێک ‹خیلی حرص داشت: زۆر هەڵپەی بوو› ۲. *[گفتاری]* ڕک؛ ڕق؛ قین؛ قینی؛ تووڕەیی ‹چرا حرص مرا در می‌آوری؟: بۆچی ڕکم هەڵدەستێنی؟› ۳. *[گفتاری]* هەڵپە؛ پەل‌وپۆ؛ هەوڵ و تەقالا بۆ بە دەس هێنانی شتێک ‹حرص زدن: هەڵپە کردن›.

⊡ **حرص خوردن:** پیش خواردنەوە؛ تووڕە بوون و دەنگ نەکردن.

**حرص داشتن:** بە هەڵپە بوون؛ چاو برسی بوون؛ چاو چنۆک بوون؛ چڵ داشتن.

**حرص زدن:** هەڵپەکردن؛ هەوڵ و حەلوەلا دان بۆ بە دەس هێنانی شتێک.

**حرص کسی را درآوردن:** کەسێ تووڕە/ وەڕەز/ قوشقی/ جاڕزکردن؛ ڕقی کەسێک هەڵساندن.

**حرص‌وجوش** / hers-o-cûš ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* *[گفتاری]* وەڕەزی؛ قەڵسی.

⊡ **حرص‌وجوش خوردن:** *[مجازی]* خۆ خواردنەوە؛ پیش خواردنەوە؛ تووشی تووڕەیی و وەڕەزی بوون ‹چقدر باید از دست تو حرص و جوش بخورم: چەندە لە دەست تۆ ئەبێ خۆم بخۆمەوە›.

**حرص‌وجوش دادن:** *[مجازی]* جاڕزکردن؛ رق هەستاندن؛ قینی دەی؛ تووشی قەڵسی و وەڕەزی کردن ‹بچەهایش خیلی به او حرص و

جوش می‌دادند: منداڵەکانی زۆر جارزیان دەکرد›.

**حرف** / harf ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. / حُروف/ پیت؛ حەرف؛ هەر کام لە نیشانەکانی ئەلف و بێتکەی زمانێک ۲. *[دستور]* پیت؛ وشەیەک کە تەنیا لەگەڵ وشەیەکی تردا دێ و مەبەستێکی تایبەتی دەگەیێنێ ‹حرف استثنا: پیتی جیاوازی› ۳. وتە؛ قسە؛ قسیە؛ قسێ ‹یکی داشت حرف می‌زد: یەکێ خەریک بوو قسەی دەکرد› ٤. *[گفتاری]* قسە؛ بەرتەک؛ ول‌ـول؛ گلەیی ‹اگر می‌خواهی بروی من حرفی ندارم: ئەگەر دەتەوێ برۆی من قسەیەکم نیە› ٥. *[مجازی]* قسە؛ دەنگۆ؛ واتۆ؛ شایعە ‹از خودت حرف درآوردی: لە خۆتەوە قسەت دەرهێنا› ٦. خراوە؛ خراپ؛ هەجب؛ هەجۆ؛ فڕ؛ کار یان ڕەوتی فڕ پێدا دان؛ خراوگوتن ‹پشت سرش حرف می‌زنند: لە پشتە سەریەوە خراو ئەیژن›.

▣ **حرف استثنا:** پیتی هاوێر/ بەدەر/ جیاواز؛ وتەی جیاوازی؛ وتەیێ کە کەس یان شتێک لەوانی‌تر جوێ دەکاتەوە (وەکوو جز:جگە).

**حرف اشتراک:** وتەی بەشداری (وەکوو هم: هاو).

**حرف اضافه:** وتەی سەربار؛ وتەی دانەپاڵ؛ پیتێ کە وشە یان سا ڕستەیێک بە بەشێکی‌تری ڕستەوە دەلکێنێ (وەک از:لە).

**حرف بزرگ** ☜ **حروف**

**حرف بیخود:** قسەی مفت؛ قسەی هیچ‌وپووچ؛ توڕڕەهات؛ قسەی بن شڕ و بێ‌واتا.

**حرف بی‌ربط:** قسەی بێ جێ/ بێخۆ؛ وتەی ناپوخت و ناڕەوا.

**حرف بی‌صدا:** پیتی کپ؛ پیتی بێ‌دەنگ؛ هەرکام لە پیتەکانی ئەلفوبێتکە (وەک ب، پ، چ، ک، ن،...) کە بۆ گوتنیان پێویستە بیاندەینە پاڵ یەکێک لە دەنگەکانەوە (وەک: بَ، با، بِ، بی، بُ، بو).

**حرف تشویق:** وتەی دڵگەرمی دان (وەکوو

جانمی: گیانەکەمی).

**حرف تصغیر:** پیتێ کە بە دوای ناوەوە دێ و نیشانەی چکۆلەییە (وەک پیتی ک لە دخترکدا بە واتای کچۆلە).

**حرف تعجب:** وتەی سەیرمان؛ وتەیەک کە نیشانەی سەیرمانی بیسەرە (وەکوو وه، بە بە مانای: پەکوو، بەهـ).

**حرف تعریف:** نیشانەی بناس؛ پیتی پێناسین؛ پیتێ کە لە برێ لە زوانانددا نیشانەی ناوی ناسراوە (وەک پیتی ه لە وشەی سگەدا، بە مانای: سەگەکە).

**حرف تنها:** پیتی تاک؛ بیچمێ لە هەر کام لە پیتەکانی ئەلفوبێتکە کە نەلکاوە بە پیتێکی‌ترەوە (وەک لە اردا، هەر سێ پیتەکە تاکن): **حرف مفرد**

**حرف تودار:** لابڕدنگ؛ زیپک؛ قسەی بە تێکول.

**حرف چسبان:** پیتی لکاو؛ پیتی نووساو؛ بیچمێ لە هەر کام لە پیتەکانی ئەلفوبێتکە کە بە پیتێکی‌ترەوە دەلکێ (وەک لە وشەی سَبَدا هەر سێ پیتەکەی لکاون).

**حرف حساب/ حسابی:** دۆغری؛ قسەی حەساوی؛ قسەی ڕێک و ڕاست و ڕەوا.

**حرف دوپهلو:** *[مجازی]* قسەی دوولایەن؛ قسەیەک کە دوو واتا یان مەبەستی لێک جیاوازی لێ ببێتەوە.

**حرف ربط:** پیتی پەیوەندی؛ پیتێ کە دوو وشە یان دوو بەشی ڕستە پێکەوە پەیوەند بدا (وەک تا و زیرا، بە مانای تا، هەتا، چوونکا).

**حرف زور:** قسەی زۆر؛ قسەی ناڕەوا کە بیانەوێت بە زۆر دروست بوونی بسەلمێنن.

**حرف شرط:** پیتی/ وتەی مەرج؛ وتەیەک کە ئەنجامی کارێ بە کارێکی دیکەوە ئەبەستێ (وەکوو اگر، چنانچە، درصورتی‌کە بە مانای: ئەگەر،

ئەر، ئەگەرکوو، هەگەتەی).

**حـــرف صـــدادار:** پـــیتی دەنگـــدار؛ پـــیتی بەدەنگ؛ یەکیتـە؛ هـەر یەکـە لـە پیتـەکانی ئـەلفوبێتکـە کـە لـە کـاتی وتنەوەیانـدا دەنـگ بـە لەرینـەوەی تارەکـانی گـەروو دێتـە دەرێ و زار دەکرێتـەوە هـەتا هـەوا بێ گرفت لـە لێـوەوە بچێتـە دەرەوە (وەکـوو: ئە، ئا، ئێ، ئی، ئۆ، ئوو).

**حرف صدتا یک غاز** ☜ **حرف مفت**

**حرف عطف:** پیتی بادانەوە/ پێوند؛ پیتـێ کـە دوو وشە پێوەند دەدا بە یەکەوە (وەکـوو بـا، و بە مانای: بە، وە).

**حرف کوچک** ☜ **حُروف**

**حرف مفت:** قسەی مفت؛ قسەی قـۆڕ/ بێخـۆ/ تورڕەهات/ لا هەلپێچراو/ بـن شـڕ/ بـێ‌واتـا: **حرف صدتا یک غاز**

**حرف مفرد** ☜ **حرف‌تنها**

**حرف ندا:** پیتی بانگ/ بانگێشتن؛ وتەیەک کە نیشانەی بانگ کـردنی کەسـێکە (وەکـوو أی، های بە مانای های، هۆی، ئەرێ).

**حرف نفی:** پیتی نا؛ وتەی نـەرێنی؛ وتەیـەک کە نیشانەی نـەبوون، نـەدار بـوون یـان هـەر چەشنە چۆنیەتیەک یـا دۆخێکـی نەرێیانەیـە (وەکوو پێش‌وشەی نـا لـە ناکارامـدا، بـە مانـای کارلێ‌نەهاتوو).

**حرف نقطه‌دار:** پیتی نوختەدار؛ پـیتی خاڵـدار (وەک ب، پ، چ و...).

**حـرف وسـط:** پـیتی ناوەنـدی؛ بیچمـێ لـە پیتی ئەلفوبێتکـە کـە ئەکەوێتـە نێـوان دوو پـــیتی دیکـــەوە و بـــە هـــەر دووکیانـــەوە دەلکـێ (وەک س و ج لـە وشـەی مـسجددا، بـە مانای مزگەوت).

⊡ **حرف آخر را اول زدن:** ڕووت و ڕاست وتـن؛ کورت و کرمانجی وتن؛ بە کـوردی و کـورتی وتن؛ مەبەستی خۆ بێ پێشەکی دەربڕین.

**حرف آخر را زدن:** قسە بڕینەوە؛ قسە یەک لا کردنەوە؛ قسەی ئاخر کـردن؛ مەبەسـتی خـۆ گوتن و کۆتایی هێنان بە قسە.

**حرف از چیزی/ کسی شـدن** ☜ **حرف چیزی/ کسی به میان آمدن**

**حـــرف از خـــود درآوردن:** قـــسە لـــە خـــۆوە دەرهێنان؛ هەڵبەسـتن؛ دەنگـۆکردن ‹او این حرف را از خودش در آورده بـود: ئـەم قـسەیەی لـە خووە دەرهینا بوو›.

**حرف از دهان کسی بیرون آمدن:** قـسەکردن؛ قسە لە زاری کەسێکەوە دەرهاتن؛ قسێ جـە دەمموو یۆینە بەر ئامەی ‹این حـرف از دهـان تـو بیرون آمد؟: تۆ ئەم قسەیەت کرد؟›.

**حرف از دهان کسی بیـرون پریـدن:** *[مجـازی]* قسە لە دەم داکەوتن/ دەرپەڕین؛ قـسێ جـێ دەمموو یۆینە ترازیەی ‹مبادا حرفی از دهانت بپرد: نەکا قسەیەکت لە دەم داکەوێ›.

**حرف از دهـان کـسی نیفتـادن:** *[مجـازی]* دەم نەوەستان؛ بێ‌پشوو/ بـێ‌وچـان قـسە کـردن؛ قسێ یاونەیوە قسێوە ‹حرفش از دهانش نمی‌افتاد: دەمی نەدەوەستا›.

**حـــرف انـــداختن از چیـــزی/ کـــسی:** باســـی شـــتێک/ کەسـێک داهێنـان؛ قـسەی شـتێ/ کەسـێ هاوردنـە بـەرەو؛ وتوویـژ سـەبارەت بـەو شـتە/ کەسـە هێنانـە پێـشەوە ‹خواسـتم حـرف خریـد خانـه را بینـدازم کـه خـانم چـشم‌غـرّه رفت: گـەرەکم بـوو قـسەی مـاڵ کـڕین دابیـنم، خاتوون مۆرێکی بردەوە›.

**حـــرف اول را زدن:** *[مجـازی]* لـــە ســـەرووی هەموانەوە بوون ‹ژاپن در زمینه‌ی الکترونیک امروز حـرف اول را مـی‌زنـد: ژاپـون ئەمڕۆکـە لـە ئیلێکترۆنیکدا لە سەرووی هەمووانەوەیە›.

**حرف بـردن و آوردن:** *[مجـازی]* ئـاوری دیـزە خـۆش کـردن؛ دەسـتەچیلە وەبـن دان؛ فیتنەیی کردن؛ قـسە بـردن و هێنـان؛ قـسە

هەڵچنین؛ باسێ جێگایەک، لە جێگەیەکی دیکەدا گوتنەوە.

**حرف بر سر کسی/ چیزی بودن:** قسە لە کەسێ/ شتێ بوون ‹حرف بر سر رفتن یان ماندن است: قسە لە سەر مانەوە یان ڕۆیشتنە›.

**حرف بزرگتر از دهن خود زدن:** *[مجازی]* ۱. فشەکردن؛ شاتوشووتکردن؛ درۆی زل کردن ۲. قسە لە خۆ گەورەتر کردن؛ قسەی زل کردن.

**حرف توی حرف آوردن:** قسە پێچاندن؛ دانە ناو باڵ قسەدا؛ قسە هێنانە ناو قسە؛ بڕ بە پەیڤینی کەسێ دان ‹تا خواستم دربارەی سفرش بپرسم حرف توی حرف آورد: تا هاتم لە سەفەرەکەی بپرسم قسەکەی پێچاند›.

**حرف توی دهن کسی بند نشدن/ نماندن:** *[مجازی]* دەمی کەسێ تەقەڵی پێوە نەبوون/ قایم نەبوون؛ قسە لە دەم کەسێکدا نەوەستان؛ دەم نەوێسیان؛ قسێ جە دەمەنە نەمدرەیوە؛ ڕازدار نەبوون.

**حرف توی دهن کسی گذاشتن:** *[مجازی]* قسە بە دەم کەسێکەوە نان؛ قسە نیانە دەم کەسێ؛ قسێ وسەینە دەمموو یۆی ‹چرا حرف توی دهن من می‌گذاری؟ من کی گفتم او را می‌شناسم؟: بۆچی قسە بە دەممەوە دەنێی؟ من کەی گوتم دەیناسم؟›.

**حرف چیزی/ کسی به میان آمدن:** قسە لە شتێ/ کەسێکەوە هاتنە گۆڕێ؛ قسەی شتێ/ کەسێ هاتنە ئاراوە ‹حرف سفر اروپا به میان آمد: قسەی سەفەری ئورووپا هاتە گۆڕێ›: **حرف از چیزی/ کسی شدن**

**حرف چیزی/ کسی را به میان آوردن:** قسە لە شتێ/ کەسێکەوەکردن؛ قسەی شتێ/ کەسێ هێنانە ئاراوە/ داهێنان؛ قسەی شتێ/ کەسێ هێنانە گۆڕێ؛ قسۆ چێویە/ یۆی ئاردەینە بەین ‹مایل نیستم حرف آن را به میان بیاورم: نامەوێ قسەی لێوە بکەم›: **حرف چیزی/ کسی را پیش کشیدن**

**حرف چیزی/ کسی را پیش‌کشیدن** ☜ **حرف چیزی/ کسی را به میان آوردن**

**حرف چیزی/ کسی را زدن:** قسەی شتێ/ کەسێ کردن؛ سەبارەت بە شتێ/ کەسێ پەیڤین ‹حرف انتخابات را می‌زدند: قسەی هەڵبژاردنیان دەکرد›.

**حرف، حرف کسی بودن:** قسە، قسەی کەسێ بوون؛ قسەی کەسێ سوار بوون ‹در خانەی ما حرف، حرف مادربزرگ است: لە ماڵی ئێمە قسە، قسەی دایەگەورەمە›.

**حرف خود را به کرسی نشاندن:** *[مجازی]* قسەی خۆ سەلماندن؛ قسەی خۆ بردنە بان گا؛ قسەی خۆ بردنە پێشەوە؛ قسۆ وێ بەردەی سەر ‹آن‌قدر گفت که آخر حرف خود را به کرسی نشاند: ئەوندەی گوت تا ئاخری قسەی خۆی سەلماند›: **حرف خود را پیش بردن**

**حرف خود را پس گرفتن:** لە قسەی خۆ پاشەکشێ کردن/ پاشگەز/ پەشیمان بوونەوە؛ وتەی پێشووی خۆ خستنە ژێر پێ ‹برای اینکە اختلافی پیش نیاید حرف خودش را پس گرفت: بۆ ئەوەی ناکۆکییەک ساز نەبێ، لە قسەی خۆی پاشەکشێی کرد›.

**حرف خود را پیش بردن** ☜ **حرف خود را به کرسی نشاندن**

**حرف خود را خوردن:** *[مجازی]* قسەی خۆ قووت دانەوە؛ قسەی خۆ خواردنەوە؛ قسۆ وێ واردەیوە؛ قسە نیوەچڵ دانان، یان بە چەشنێ جگە لە مەبەستی دیاریکراو دریژەپێدان ‹داشت می‌گفت من دیگر در آن خانه نمی‌مانم، ولی حرف خود را خورد: خەریک بوو ئەیگوت من ئیدی لەو

ماڵه نامێنمه‌وه، به‌ڵام قسه‌که‌ی قووت داوه›.

**حرف خود را یکی کردن:** سێ و دووی دڵی خۆ کردن؛ قسه‌ی خۆ یه‌کانگیر کردن؛ قسه‌ی خۆ کردنه یه‌ک؛ له سه‌ر قسه‌یه‌ک پێکهاتن؛ سه‌باره‌ت به قسه‌یه‌کی دیاریکراو پێکهاتن ‹اول باید حرف خودمان را یکی کنیم و بعد برای مذاکره با طرف برویم: سه‌ره‌تا ده‌بێ قسه‌کانمان یه‌کانگیر بکه‌ین ئه‌مجار برۆین بۆ وتوویژ›.

**حرف داشتن:** قسه بوون: ۱. *[مجازی]* به‌رهه‌ڵست بوون ‹اگر خواستم بروم، تو حرفی داری؟: ئه‌گه‌ر ویستم برۆم، تۆ قسه‌یه‌کت هه‌یه؟› ۲. قسه‌پێ‌بوون؛ قسێ بیه‌ی؛ هه‌بوونی بڕوا یان بیرۆکه‌یه‌ک له‌مه‌ڕ بابه‌تی باس‌لێکراوه‌وه ‹در این مورد هم یکی-دو حرف دارم که بد نیست بگویم: له‌م باره‌وه منیش یه‌کێ- دوو قسه‌م هه‌یه خراو نیه بێژمی›.

**حرف درآوردن:** هه‌ڵبه‌ستن؛ قسه ساز کردن؛ قسه بۆ خۆش کردن؛ قسه بۆ ده‌رهێنان؛ قسێ په‌ی به‌ر ئارده‌ی؛ قسه به‌ستن ‹پشت سرش حرف درآوردند و گفتند با آدمهای ناباب رفت‌وآمد دارد: به شوێنیه‌وه قسه‌یان هه‌ڵبه‌ست و گوتیان له‌گه‌ڵ که‌سی خراپا هاتوچووی هه‌یه›.

**حرف دل کسی را زدن:** *[مجازی]* قسه‌ی دڵی که‌سێ کردن ‹داشت حرف دل ما را می‌زد: خه‌ریک بوو قسه‌ی دڵی ئیمه‌ی ده‌کرد›.

**حرف دهن خود را نفهمیدن:** تام ده‌م خۆ نه‌زانین؛ نه‌زانین چی گوتن؛ قسه نه‌جاوین؛ قسێ وه‌رێ ده‌ی؛ به‌بێ تێفکرین قسه‌کردن ‹او حرف دهنش را نمی‌فهمد: کابرا تام ده‌م خۆی نازانی›.

**حرف را پیچاندن:** *[مجازی]* قسه گۆڕان؛ قسێ پێچێ وسه‌ی؛ لادان له مه‌به‌ستی سه‌ره‌کی وتوویژ ‹چرا حرف را اینقدر می‌پیچانی؟: بۆچی ئه‌مه‌نده قسه ده‌گۆڕی؟›.

**حرف را (از دهان کسی) قاپیدن:** *[مجازی]* قسه له ده‌م که‌سێک قۆستنه‌وه ‹تا گفتم امروز حقوق گرفته‌ام، حرف را از دهان من قاپید و گفت: پس طلب مرا بده!: تا گوتم ئه‌مڕۆ مووچه‌م وه‌رگرتووه قسه‌که‌ی له ده‌مم قۆستەوه و گوتی: ده‌سا پاره‌که‌م بده‌وه!›.

**حرف را عوض کردن:** قسه گۆڕین؛ قسه واڕه‌ی: ۱. بابه‌تی گفتوگۆ گۆڕان ‹تا او آمد حرف را عوض کردم: تا هات قسه‌که‌م گۆڕی› ۲. له شاهۆوه چوون بۆ پاهۆ؛ گوتنی قسه‌یه‌ک جگه له قسه‌ی پێشوو ‹حرف را عوض نکن، جواب مرا بده: له شاهووه مه‌چۆ بۆ پاهۆ، وڵامم بده‌ره‌وه›.

**حرف زدن:** قسه‌کردن: ۱. ئاخافتن؛ ئاخاڤتن؛ په‌یڤین؛ دوان؛ دوه‌ی؛ چنه داین؛ ده‌نگ‌کردن ‹یکی داشت حرف می‌زد: یه‌کێ خه‌ریک بوو قسه‌ی ده‌کرد› ۲. پێکه‌وه قسه کردن؛ یه‌ک دوان؛ هه‌ڤپه‌یڤین ‹با هم حرف می‌زدیم: پێکه‌وه قسه‌مان ده‌کرد›.

**حرف شدن:** بوونه قڕه/ قسه؛ ده‌مه‌قاڵه بوون؛ بوونه قاڵ؛ ده‌مه‌قڕێ بیه‌ی؛ به ده‌نگ بوون؛ به شه‌ڕه‌وه وتوویژ کردن ‹آخرش با آزاد حرفمان شد: له ئاخریا له‌گه‌ڵ ئازاد بوو به قڕه‌مان›.

**حرف شنیدن:** ۱. ☜ **حرف گوش کردن** ۲. قسه بیستن؛ قسه ژنه‌فتن؛ سه‌رکۆنه کریان؛ تانه و لۆمه بیستن ‹به خاطر این خانه چقدر از این و آن حرف شنیدم: بۆ ئه‌م ماڵه چه‌ندم له‌م و له‌و قسه بیست›.

**حرف صدتا یک غاز زدن** ☜ **حرف مفت زدن**

**حرف کسی با دیگری یکی بودن:** قسه یه‌کێ بوون؛ یه‌ک شت گوتن؛ قسه‌ی که‌سێ له‌گه‌ڵ ئه‌وی دیکه‌دا یه‌کانگیر بوون؛ قسێ یۆ بیه‌ی ‹هر دو حرفشان یکی بود: هه‌ردووکیان قسه‌یان یه‌کێ بوو›.

**حرف کسی خریدار نداشتن:** *[مجازی]* قسه‌ی

کەسێ نەڕۆیشتن؛ گـا بـە دەنگـی کەسـێک نەڕۆیشن؛ قسەی کەسێ بێبرەو بـوون؛ قـسۆ یۆی نەشیەی ‹دیـدم حـرف مـن در آنجـا خریـدار ندارد، حرف نزدم: دیم لـەوێ قـسەم نـاروا، هـیچم نەگوت›.

**حـرف کـسی دَررو داشـتن:** *[کنـایی]* قـسەی کەسێ بەبرەو/ بە بڕشت بوون؛ قسەی کەسێ ڕۆیشتن؛ بە بایـەخ بـوونی قـسەی کەسـێک لەلایەن کەسانی دیکـەوە ‹آن روز حـرف او دررو داشت: ئەو ڕۆژە قسەی بەبرەو بوو›.

**حرف کسی دو نشدن** ☜ **حرف کسی یکی بودن**

**حـرف کـسی را بریـدن:** *[مجـازی]* قـسەی کەسـێ بـڕین؛ دانـە نـاو بـاڵ قـسەی کەسێکدا؛ بە سـەر قـسەی کەسـێکدا پـەڕین ‹حـرفم را بریـد و گفـت: دیگـر بـس اسـت: قسەکەی بڕیم، وتی: ئیتر بەسە›.

**حرف کسی را به خود گرفتن:** *[مجازی]* قـسەی کەسێ کێشانە سەر خۆ؛ قسەی کەسـێ بردنـە سەر خۆ ‹حـرف مـرا بـە خـودش گرفـت و از مـن ناراحت شد: قسەکەی منی بردە سەر خـۆی و لـێم ڕەنجا›.

**حرف کسی را به دل گرفتن:** *[مجازی]* قـسەی کەسێ گرتنە دڵ؛ لە کەسـێ ڕەنجـان ‹حـرف پدرت را به دل نگیر: قسەی بابت مەگرە دڵ›.

**حـرف کـسی را (بـه) زمـین انـداختن:** *[مجـازی]* قـسەی کەسـێک نانـە ژێـر پـا؛ بـە زەویـدا دانی قـسەی کەسـێ؛ قـسەی کەسـێ لـە بـەرد دان؛ قـسۆ یـۆی مـاڕایوە ‹چـرا حـرف مـادرت را زمـین انـداختی؟: بـۆچی قسەی دایکت نایە ژێر پێ؟›.

**حرف کسی را خواندن:** شوێن قـسەی کەسـێ کـەوتن؛ پـەزێرانی قـسەی کەسـێ و بـە دوا کەوتنی ‹کسی حرف تو را نمی‌خواند: کەس شوێن قسەی تۆ ناکەوێ›.

**حرف کسی یکی بودن:** قسەی کەسـێ یـەکێ بوون؛ وتەی خۆ نەگۆڕان ‹حرف مرد یکی است: قسەی پیاو یەکە›: **حرف کسی دو نشدن**

**حرف کشیدن:** ١. لـە زمـان کێـشانەوە؛ قـسە دەرکێشان؛ سەر داکێشان؛ قـسە دەرهێنـان؛ قسێ کێـشتەیرە؛ قـسە دەرهـاوردن؛ نهـێنی پێدرکاندن ‹رفت از دخترشان حرف کشید: چوو لە زمانی کچەکەیانی کیشاوە› ٢. قسەی نـاخۆش بیستن؛ قسە بیستن؛ پەزێرانی قسەی ناخۆش ‹سر این کار چقـدر از ایـن و آن حـرف کـشیدم: بـە بۆنەی ئەم کارەوە چەندەم قسەی نـاخوش لـەم و لەو بیست›.

**حرف گـوش کـردن:** گـوێ گـرتن؛ گوێچکـە دان؛ گوێچکـە تەکانـدن/ تـەکانن؛ قـسێ گـۆش دەی؛ گۆشـەنـە دارەی؛ بـە قـسە گوێ دان؛ بە قـسە کـردن؛ بـە گـوێ کـردن ‹حـرف مـادرت را گـوش کـن: بـۆ قـسەی دایکـت گوێ بگرە›: **حرف شنیدن**

**حرف مفت زدن:** قـسەی مفـت/ قـۆڕ کـردن؛ قسەی بێخۆ کردن: **حرف صدتا یک غاز زدن**

**حـرف نداشـتن:** *[مجـازی]* قـسە نـەبوون: ١. دژایەتی نەکردن ‹اگر کتاب را لازم داری ببـر، من حرفی ندارم: ئەگەر کتێبەکەت پێویـستە ببیـە، مـن قـسەیەکەم نیـە› ٢. قـسە تێـدا نـەبوون؛ بێعەیب بـوون ‹ایـن ماشـین حـرف نـدارد: ئـەم ماشێنە قسەی تێدا نیە›.

**از حرف خود برگشتن:** قسەی خۆ خواردنـەوە/ وەرگرتنەوە؛ لە قسەی خۆ پەشیمان بوونـەوە؛ لە سەر قسەی خۆ نەوەستان ‹اول ما را به شام دعوت کرد، ولی بعـد از حـرف خـودش برگـشت: لـە پێشدا بۆ شێو بانگی کردین بەڵام دوایـی قـسەی خۆی خواردەوە›.

**بـه حـرف آمـدن:** هاتنـە/ کەوتنـە قـسە؛ بـە قـسە هـاتن؛ ئامـەیوە قـسێ؛ دەسـپێکردنی قـــــسە (بەتایبـــــەت دوای ماوەیـــــەک دوورەپەرێزی لـە قـسەکردن) ‹آخـرش بـە حـرف

آمد و گفت، دیشب پیش آزاد بود: ئاخری هاته قسه و گوتی، دویشەو لای ئازاد بووه›.

**به حرف آوردن:** هێنانه قسه؛ ئاردەیوه قسێ ‹آخرش آرام را به حرف آوردم و همه چیز را برایم گفت: ئاخری ئارامم هێنایه قسه و هەموو شتێکی پێ‌گوتم›.

**توی حرف کسی دویدن** ☜ **تو**[۲]

**روی حرف کسی حرف زدن** ☜ **رو**[۲]

**سر حرف خود ایستادن/ بودن** ☜ **سر**[۳]

**حرف** /heraf/: [عربی] جمعِ ☜ **حرفه**

**حرف‌بری** /harfbarî/: [عربی/ فارسی]/اسم. /گفتاری/ قسەبەری؛ شووفاری؛ شۆفاری؛ شوفاری؛ دووزمانی؛ کار یان ڕەوتی قسه هێنان و بردن.

**حرف‌شنو** /harfšeno: ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. ۱. بەگوێ؛ گوێ لەمست؛ بەلبەلەگۆش؛ گۆش‌بەرئاواز ۲. گوێ‌ڕادێر؛ گۆش‌گیر؛ مۆچیاری‌گێر. هەروەها: **حرف‌نشنو**

**حرف‌شنوی** /harfšenavî، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. ۱. گوێ لەمستی؛ بەلبەلەگۆشی؛ گۆش‌بەرئاوازی ۲. گوێ‌ڕادێری؛ گوێگری.

**حرفه** /herfe، ـها؛ حَرَف/: [عربی]/اسم. پیشه ‹حرفه‌ی خانوادگی: پیشەی بنەماڵەیی›.

**حرفه‌ای** /herfe'î، ـها/: [عربی] صفت. پیشەیی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە پیشەوە ‹آموزش حرفه‌ای: فێرکاری پیشەیی› ۲. پێوەندیدار یان سەر بە پیشەیەکی هەمیشەییەوە. بەرانبەر: **آماتور** ‹کشتی‌گیر حرفه‌ای: زۆرانبازی پیشەیی›.

**حرفی** /harfî/: [عربی] صفت. ۱. پیتی. بەرانبەر: **عددی** ۲. /ـها/ پیت‌دار؛ خاوەن پیت ‹سه حرفی: سێ پیتی›.

**حرکات** /harakāt, harekāt/: [عربی] جمعِ ☜ **حرکت**

**حرکت** /harakat, harekt، ـها/: [عربی]/اسم. جووڵه؛ جمشت؛ جم؛ زیوه؛ جڤ؛ لەبت: ۱. ئاڵوگۆڕ؛ ئازوگۆز؛ کار یان ڕەوتی جێگە گۆڕانەوە ‹حرکت انتقالی: جووڵەی گواستنەوەیی› ۲. /حرکات/ جم و جووڵ؛ کردەوە؛ ئاکار؛ خوریک‌خاو؛ خلێوخاو ‹حرکت نامعقول: ئاکاری نەگونجاو› ۳. /دستور/ بزوێن؛ دەنگ؛ دەنگێ کە پیت لە کپی دەردێنێ (وەک سەرە، ژێرە و...) ٤. /موسیقی/ ئەندازەی سەر و ژێر و چوونی دەنگی یەک یان چەند نوتی مۆسیقا ٥. /حرکات/ بزاڤ؛ بزاو؛ جم و جووڵ؛ گل‌پل؛ گل‌گەوز؛ کاری جووڵانەوە؛ جمان؛ جومین؛ نرڤان؛ زیوان.

▣ **حرکت ارادی:** /پزشکی/ بزاڤی ویستی؛ جووڵەی ئەندامێک یان تەواوی بەدەن بە خواست و ویستی خۆ. هەروەها: **حرکت غیرارادی**

**حرکت آزاد:** سقوط آزاد ☜ **سقوط**

**حرکت انتقالی:** ۱. جووڵەی گواستنەوەیی؛ جۆرێک جووڵەی هەمووانی تەنێک لە سەر هێڵ یان شوێنێکی دیاریکراو ۲. /نجوم/ خولانەوەی زەوی و باقی گەڕۆکان بە دەوری هەتاودا.

**حرکت پسرفت:** سیر قهقرایی ☜ **سیْر**

**حرکت تناوبی:** هاتوچۆ؛ هەر شێوە جووڵەیەک کە لە کاتێکی دیاریکراودا دووپاتە بێتەوە.

**حرکت چرخشی:** خول؛ سووڕ؛ گەڕان لە سەر جەغزێک یان بە دەوری خۆدا.

**حرکت غیر ارادی:** /پزشکی/ لاکە؛ لاک؛ جووڵەی ناویستەکی؛ بزووتنی ئەندامێک یان تەواوی لەش بەبێ ویستی خۆ. بەرانبەر: **حرکت ارادی**

**حرکت مُستدیر:** سووڕ؛ جووڵەی لە سەر جەغز.

**حرکت وضعی:** ۱. خول؛ جووڵە لە جێ خۆوە و بە دەوری خۆدا ۲. /نجوم/ خول خواردنی زەوی و باقی گەڕۆکان بە دەوری خۆدا.

▣ **حرکت دادن:** ١. شەکاندنەوە؛ جوولاندن؛ بزواندن؛ جواندن؛ جماندن؛ لڤاندن؛ لەقاندن؛ تەکان دان؛ لڤاندن؛ ورجمن ‹دستش را حرکت داد: دەستی شەکاندەوە› ٢. تەکان‌دان؛ جوولاندنەوە؛ هەرکاندن؛ لەپتاندن؛ لەبتاندن؛ تەکان پێدان؛ ئازوگۆزکردن؛ ئاڵ‌وگۆڕکردن؛ واڕایوە ‹نتوانست صندوق را حرکت دهد: نەیتوانی سندووقەکە تەکان بدا› ٣. بەڕێ کردن؛ هەناردن؛ ناردن؛ ڕێ‌خستن؛ ڕوانە کردن؛ کیاستەی؛ جمنایرە ‹زن و بچه را حرکت داد تا زودتر برسند: ژن و مناڵەکەی بەڕێ کرد بەشکوو زووتر بگەن›.

**حرکت کردن:** بزووتن؛ لەقین؛ لقین؛ جوولان؛ تەکان خواردن؛ هەرکین؛ لەرانەوە؛ لەوان؛ لەبتین؛ لەوتەنە؛ جمان؛ جمیاین؛ جمەی؛ لەپتین؛ لێویەی.

**از حرکت بازماندن:** لە جوولە کەوتن؛ لە تەکان کەوتن. هەروەها: **از حرکت بازداشتن**

**بە حرکت درآوردن:** ١. بزواندن؛ خستنە گەڕ/ جوولەوە؛ جوولاندنەوە؛ ئەرەجمنەی؛ جمنایرە ٢. گۆزانەوە؛ گواستنەوە؛ جێبەجێ کردن؛ ئاڵشت کردن؛ ئاڵ‌وگۆڕکردن؛ ئەوەوارەی؛ واڕایوە.

**حرکتی** / harakatî,harekatî/: [عربی] *صفت.* بزاوی؛ براقی؛ جوولەیی؛ لەبتی؛ جمشتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە جوولەوە ‹اندامهای حرکتی: ئەندامانی بزاوی›.

**حرم** / haram ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ١. حەرەم؛ ژووری زیارەتانی ئایینی ‹توی حرم بودیم کە سروصدا بلند شد: لە نێو حەرەمدا بووین هەراوهۆریا بەرزەوە بوو› ٢. حەرەمسەرا؛ هەرەم؛ ژووری ئەندروون.

**حرمان** / hermān/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* ١. بێ‌بەشی؛ دوورەبەشی ٢. نامرادی؛ بێ‌ئاکامی.

**حرمان‌زده** / hermānzade/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بێ‌بەش؛ دوورەبەش؛ تووشی نامرادی بوو.

**حرمت** / hormat/: [عربی]/*اسم.* ١. ڕێز؛ قەدر؛ حورمەت؛ کار یان ڕەوتی ڕێز لێنان؛ مەزنانەن؛ خەمنانەن ٢. ناڕەوایی؛ حەراس؛ دۆخ یان چۆنیەتی حەرام بوون ‹حرمت ربا: ناڕەوایی سوو›.

▣ **حرمت کسی را شکستن:** سووکایەتی کردن بە کەسێ.

**حرمت کسی را نگهداشتن:** ڕێز بۆ کەسێ دانان؛ ڕێز لە کەسێ گرتن ‹پدرم خیلی حرمت او را نگه می‌داشت: بابم زۆر ڕێزی بۆ دادەنا›.

**حرمت گذاشتن:** ڕێز لێگرتن؛ خاترگرتن؛ ڕێز لێنان؛ حورمەت گرتن؛ سەنگ نیان؛ سەنگ لێ‌نان؛ سەنگ گرتن؛ مەزنانەن؛ خەمنانەن ‹خواست به من حرمت بگذارد، از پشت میزش بلند شد: ویستی ڕێزم لێ‌بگری، لە پشت مێزەکەیەوە هەستا›. هەروەها: **حرمت داشتن؛ حرمت کردن**

**حرمخانە** / haramxāne/: [عربی/ فارسی] ☜ **حرمسرا**

**حرمسرا** / haramsarā ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم. [قدیمی]* حەرەمسەرا؛ ئەندەروون؛ هندروو؛ هوندروو؛ خانووی جێگەی ژنانی ماڵ: **حرمخانە**

**حروف** / hurûf, horûf/: [عربی]/*اسم.* ١. جمعِ ☜ **حرف** ٢. پیتی چاپەمەنی؛ هەرکام لەو پیتانە لە پیتچنی یان ماشین‌نووسیدا بە کار دەبرێن.

▣ **حروف ابجد:** پیتی ئەبجەد؛ پیتگەلی ئەلف‌وبێتکەی عەرەبی کە بە هەشت لەبز ڕیز کراون و هەر پیتێک بەرامبەر بە ڕەقەمێکە، بەم شێوە: «اَبْجَدْ، هَوَّزْ، حُطّی، کَلَمَنْ، سَعْفَصْ، قَرَشَتْ، ثَخَّذْ، ضَظَغْ».

**حروف الفبا:** پیتی ئەلف‌وبێتکە؛ سەرجەمی نیشانەگەلێ کە وشە و ڕستەی زمانێک بەوانە دەنووسرێن: **حروف تَهَجّی**

**حروف ایتالیک:** پیتی ئیتالیک؛ جۆرێ پیتی چاپی لاتینی و یۆنانی، بە شێوەی هێندێک بەلاداهاتوو.

**حروف ایرانیک:** پیتی ئیرانیک؛ جۆرێ پیتی چاپی ئەلفوبێتکەی فارسی، بە شێوەی هێندێک بەلاداهاتوو.

**حروف بزرگ:** پیتی گەورە؛ چەشنێ لە پیتی ئەلفوبێتکەی یوونانی و لاتینی بە شێوەی درشت‌تر و شێوازی خەتی کۆنی یۆنانی.

**حروف تحریری:** بیچمێک لە پیتی لاتینی کە لە نووسین یان لە چاپی وەک دەستنووسدا بە کار دەبرێن.

**حروف تَهَجّی** ☜ **حروف الفبا**

**حروف چاپ:** پیتی چاپ؛ قاڵبگەلی کانزایی کە نەخشی پیتی ئەلفوبێتکە، نیشانە و ژمارەکان لە سەریاندا هەڵکۆڵراون و بۆ چاپ بە کار ئەبرێن.

**حروف سایه‌دار:** پیتی سادار؛ جۆرێک پیتی چاپی کە وەک سێبەری کەوتبێ وایە.

**حروف سیاه:** پیتی قەڵەو؛ پیتی ڕەش؛ جۆرێک پیتی چاپی کە ئەستوورتر لە پیتی ئاساییە.

**حروف کوچک:** پیتی چکۆلە؛ شێوە خەتێکی بچووک و جەم و جۆر کراوەی لاتینی.

**حروف نازک:** پیتی ناسک؛ پیتی ئاسایی چاپ.

**حروف‌برگردان** / hurûfbargardān, horûf- /: [عربی/ فارسی] ☜ **لِتراسِت**

**حروفچین** / hurûfčîn, horûf- ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پیت‌چن: ۱. /قدیمی/ کەسێ کە پیتی کانزایی چاپ بۆ چاپ کردن لە پاڵ یەک دەچنێ و لاپەڕەی چاپی پێک دێنێ ۲. کەسێ کە بە ماشێنی تایپ یان کامپیوتەر، نووسراوەیەک دەنووسێ.

**حروفچینی** / hurûfčînî, horûf- /: [عربی/ فارسی]/اسم. پیت‌چنی؛ پیتکاری: ۱. کار یان ڕەوتی ئامادەکردنی پیت بۆ چاپی نووسراوەیەک ۲. /ـها/ جێگای تایبەتی ئەو کارە.

▣ **حروفچینی دستی:** پیت‌چنی دەستی؛ کاری پیت‌چنی بە پیتی کانزایی.

**حروفچینی کامپیوتری:** پیت‌چنی کۆمپیوتەری؛ پیت‌چنی بە کۆمپیوتەر.

**حریت** / horrîyat, horîyyat /: [عربی]/اسم. /ادبی/ جوامێری؛ ئازادەیی؛ مێرخاسی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەربەست بوون.

**حریر** / harîr /: [عربی]/اسم. ۱. هەوریشم؛ ئاوریشم ۲. حەریر؛ پارچەی ناسکی ئاوریشمی ۳. خەزگ؛ بەرگی ئاوریشمی تێکەڵ بە پەشم یان پەموو ‹حریر پشمی: حەریری پەشمی›.

**حریره** / harîre /: [عربی]/اسم. حەریرە؛ شلەیەک لە نشاستە و ئاردەبرنج و کاکڵەی بادام و شەکر (زۆرتر بۆ منداڵ و نەخۆش) سازی دەکەن.

**حریص** / harîs ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. ۱. چاوچنۆک؛ چەڵماس؛ چەڵماسک؛ چاوچلێس؛ چاوبرسی؛ چاڤبرچی؛ چاونەزێر؛ تێرنەخۆر ‹حریص با جهانی گرسنه است و قانع به نانی سیر: چاوچنۆک دنیاشی هەبێ، هەر برسیە و چاوتێر پاروە نانێکی دەسکەوێ بەسیە› ۲. /گفتاری/ بەهەڵپە؛ چلێس؛ یەکجار خوازیاری شتێک و بە پەلە بۆ پێ‌گەیشتنی بوون ‹خیلی به سینما حریص بودم: بۆ سینەما زۆر بەهەڵپە بووم›.

**حریف**[1] / harîf ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. ۱. حەریف؛ غەنیم؛ خەنیم؛ هەڤبەر؛ هەڤبەز؛ لایەنی بەرانبەر لە ڕکەبەرێ یان ململانەیەکدا ‹دو حریف خوب جنگیدند: حەریفەکان ململانێکی باشیان کرد› ۲. /ادبی/ هاوڕێ؛ هاونشین؛ هامدەم؛ هامپا؛ هاوتا؛ هاولف؛ هاوباز ‹یار آن حریف نیست که از در درآیدم: یارم ئەو هاوڕێیە نیە لێم بکاتە دەرگادا›.

**حریف**[2]: صفت. هاوکێش؛ هاوماڵ؛ لف؛

خـاوەنی توانـایی بـۆ ڕکەبـەرکێ لەگـەڵ خەنیمـدا ‹او بـەتنهـایی حریـف پـنج نفـر اسـت: بەتـەنیایی هاوکێـشی پێـنج کەسـە›. هـەروەها: **حریف بودن؛ حریف شدن**

**حریق** / harîq/: [عربی]/اسم. سووتمان؛ سـووتان؛ شـەوات؛ ئـاگر بەربوونـەوە؛ ڕەوتی ئـاگرگرتنی جێگە یا شتێک ‹حریق انبار: سووتمانـی هەمار›.

**حـریم** / harîm ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. هـەرێم: ۱. هەوێرکە؛ ولگە؛ بەن؛ بەشێ لە زەوینی دەور و بەری خانووبەرە، باخ یان جادە و هێڵی ئاسـن یا دیـاردەگـەلی سروشـتی وەک زەریـا، ڕۆبـار، لێـڕەوار و... ‹حـریم جنگـل: هـەرێمی لێـڕەوار› ۲. *[مجازی]* سنوور یان بەردەستی شتێکی بەڕێز یان پیرۆز کە پێ لـە سـەر داگـرتنی بـە نـاڕەوا دەزانن ‹حریم قانون؛ حریم خانواده: سنووری قـانوون؛ هەرێمی بنەماڵە›.

**حـزب** / hezb ، ـهـا؛ احـزاب/: [عربـی]/اسـم. حیـزب؛ پـارت؛ دامەزراوەیـەکی ڕامیـاری کـە ڕاهێنـانێکی تایبـەتی بـۆ بـەڕێوەبردنی وڵاتێـک، پێوەنـدی لەگـەڵ وڵاتـانی دیکـە و دەسـکەوتنی ئامانجگـەلێکی دیـاریکراوی مەبەستە.

**حزبی** / hezbî/: [عربی] صفت. حیـزبی؛ پـارتی: ۱. پێوەندیدار یـان سـەر بـە حیزبـەوە ‹فعالیت حزبی: چالاکی حیزبی› ۲. /ـها/ ئەنـدامی حیـزب ‹شخصیت حزبی: کەسایەتی حیزبی›.

**حزم** / hazm/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* دوورئەندێـشی؛ دوورنواڕی.

**حزن** / hozn/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* خەفەت؛ خـەم؛ مـۆزە؛ تـەمیان؛ کەسـەر؛ کـوڵ؛ جغـار؛ خجـاز؛ جخار؛ جەخار؛ کۆڤـان؛ گـژم؛ عـەزرەت؛ ئەنـدۆ؛ غەم؛ پەژارە؛ تانۆت؛ کرێـب؛ حـەژمـەت؛ زاخـاو؛ سوێ.

**حزن‌آلـود** / hoznālûd/: [عربـی/ فارسـی] صفت. *[ادبـی]* خـەمین؛ خـەمبار؛ غـەمگین؛ ناشـاد؛ مەینەتبار ‹صدای حزن‌آلود: دەنگی خەمین›.

**حزن‌انگیز** / hozn'angîz/: [عربی/ فارسـی] صفت. *[ادبی]* خەمبزوێن؛ خەمان‌خێـز؛ خـەماوب؛ هـۆی سەرهەڵدانی کوڵ و کەسەر ‹سرگذشت حزن‌انگیـز: بەسەرهاتی خەمبزوێن›.

**حزن‌آور** / hoznāvar/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[ادبی]* خەمهێنەر؛ گژمێنەر؛ خەماوەر؛ خەفـەتهێنـەر؛ هـۆی پەیـدا بـوونی خـەم و خەفـەت ‹واقعـەی حزن‌آور: ڕووداوی خەمهێنەر›.

**حزیران** / hazîrān/: [سریانی]/اسم. حـوزەیران؛ جـوون؛ مـانگی شەشـەمی سالـپێوی هـەتاوی وڵاتـانی عـارەبی، بەرانبـەر بـە مـانگی ژوەنی زایینی کە ۳۰ ڕۆژە.

**حـــزین** / hazîn/: [عربـــی] صـــفت. *[ادبـــی]* خـــەمبار؛ خـــەمین؛ گـــژمین؛ غـــەمگین؛ مۆژەمـــەن؛ ناشـــاد؛ خـــەماوی؛ مەینـــەتبار ‹آواز حزین: ئاوازی خەمبار›.

**حـس** / hes(s) ، ـهـا/: [عربـی]/اسم. هەسـت؛ شـەس؛ هـاس؛ هۆشـە؛ دۆنگـی: ۱. هـشەک؛ توانـای وەرگـرتنی پـەیام یـان پـێ زانـین بـە هۆی ئەندامگـەلی هەسـتیەوە ‹حس داشـتن: بـە هەسـت بـوون› ۲. /حـواس/ زی؛ هـەر کـام لـە ئەنـدامانی لەشـی گیانـەوەران کـە کـاری ناسـینی بزوێنـەی دەرەکیـە (وەکـوو هەسـتی بینـایی، ژنـەوایی، چێژایـی و...) ‹حـس چـشایی: هەســتی چێژایــی› ۳. زانــینی لــێڵ و ناخاترجـەم ‹حـس کـردم مـی‌خواهـد حرفـی بزنـد: هەسـتم کـرد دەیهـەوێ قـسەیەک بکـات› ٤. زەوق و هــۆگری بــە شــتێک ‹حـس مـیهن‌دوسـتی؛ حـس انـسان‌دوسـتی: هەسـتی نەتەوایـەتی؛ هەسـتی مرۆڤدوسـتی› ۵. توانـای بـە کـار خـستنی هێـزی مێشک بـە شـێوەی کـارا ‹حـس تـشخیص: هەسـتی ناسـینەوە›. هەروەها: **حس داشتن؛ حس کردن**

▣ **حس باصره** ☜ **بینایی**

**حس ذایقه** ☜ **چشایی**

**حس سامعه** ☜ **شنوایی**

**حس لامسه** ☜ **بِساوایی**

**حس شامه** ☜ **بویایی**

⊡ **حس کردن:** هەست کردن؛ هەسین.

**حساب** / hesāb/: [عربی]/اسم. حەساو؛ حیساب؛ حەسێب. ١. هەسوو؛ لقێ لە زانستی بیرکاری ٢. /ـها/ سیاهە؛ ڕیزی قەرز و فەرزی کەس یان ڕێخراوەیەک لەگەڵ کەس یان ڕێخراوەیەکی‌تردا ‹حساب شما خیلی بالا رفته، قدری پول بدهید: سیاهەتان زۆرچۆتە سەر، هێندێک پارەمان بدەنێ› ٣. قەرز یان بستێنکاری ‹چرا حساب ما را نمی‌دهید: بۆچی حەساوی ئێمە نادەی؟› ٤. سیاهەی دارایی، سەودا، قەرزداری یان قەرزدەری کەسێ یان ڕێخراوەیەک ٥. نرخی کالا یان ڕاژەی سەوداکراو ‹حسابمان چقدر شد؟: حەساومان بوو بە چەند؟› ٦. ژمار؛ ژمارە؛ ئەژمار؛ هەژمار ‹حساب گلهای تیم برنده: ژماری گولەکانی تیمی سەرکەوتوو› ٧. ڕەوت؛ دۆزەنە؛ ڕێک‌وپێکی و گەڕانی کار ‹مواظب باش حساب کار از دستت در نرود: هۆشت بێ ڕەوتی کار لە دەستت دەرنەچێ› ٨. بڕیارنامە یان پێکهاتی نێوان کەسانێک بۆ سەودا کردن و داوسانی پارە یان کالا ‹حساب بانکی؛ حساب پس‌انداز: حەساوی بانکی؛ حەسێبی پاشکەفت› ٩. هۆکار؛ هۆ؛ سەبەب ‹روی چە حسابی این حرف را می‌زنی؟: لە سەر چ حەساوێک ئەم قسە دەکەی؟› ١٠. کاری ژماردن یان پێدا گەیشتن بە ژمارە یان چۆنیەتی شتێک ‹مهمانها را حساب کن ببین چند نفرند: میوانەکان حەسیب کە بزانە چەن کەسن› ١١. کاری زانین؛ دانان؛ گرنگی پێدان، بایەخ پێ دان یان بە شتێ دانان ‹اصلاً او را آدم حساب نمی‌کنند: هەر بە بنیادەمی نازانن›.

⊡ **حساب ابجد:** حەسێبی ئەبجەد؛ حەساوی ئەبجەد: **حساب جُمَل**

| | | |
|---|---|---|
| الف =١ | ک =٢٠ | ر =٢٠٠ |
| ب =٢ | ل =٣٠ | ش =٣٠٠ |
| ج =٣ | م =٤٠ | ت =٤٠٠ |
| د =٤ | ن =٥٠ | ث =٥٠٠ |
| هـ =٥ | س =٦٠ | خ =٦٠٠ |
| و =٦ | ع =٧٠ | ذ =٧٠٠ |
| ز =٧ | ف =٨٠ | ض =٨٠٠ |
| ح =٨ | ص =٩٠ | ظ =٩٠٠ |
| ط =٩ | ق =١٠٠ | غ =١٠٠٠ |
| ی =١٠ | | |

**حساب بانکی:** حەساوی بانکی؛ حەسێبی بانقی؛ جۆرێ بڕیارنامەی نێوان کەس یان دامەزراوەیەک لەگەڵ بانکدا بۆ پارازتنی پارە لە بانک و وەرگرتنی لە هەرکاتێکی پێویست یان لە پاش ماوەیەکی دیاریکراودا.

**حساب پس‌انداز:** حەسێبی پاشەکەوت؛ حەساوی پاشەکەفت؛ چەشنێک حەساوی بانکی بۆ پاشەکەوت خستنی پارە لە لای بانکێکەوە.

**حساب جاری:** حەسێبی بەردەست؛ جۆرێک حیسابی بانکی کە خاوەنەکەی بۆی هەیە خۆی یان هەر کەسێکی‌تر بیەوێ بۆ پارە هەڵگرتن لەو حیسابە یان پارە تێخستنی بەشدار بێ.

**حساب جُمَل** ☜ **حساب ابجد**

**حساب ذهنی:** حەساوی زەینی؛ جۆرێ حەساوکردن بە یارمەتی زەین بێ کەڵک گرتن لە قاقەز و قەڵەم.

**حساب سرانگشتی:** بەراوردی سانا و هاسان ٢. /مجازی/ حیسابی بەبێ بەڵگە و نووسراوە.

⊡ **حساب از دست کسی در رفتن:** حەساو لە دەس کەسێک دەرچوون؛ ڕا لە دەس کەسێکدا نەمان/ دەرچوون؛ تووشی هەڵە و شڵەژاوی بوون ‹مواظب باش حساب از دستت درنرود: هۆشت بێ حەساو لە دەستت دەرنەچێ›.

**حساب باز کردن:** ۱. حیساب‌کردنه‌وه؛ حه‌ساو وازکردن؛ له‌گه‌ڵ بانکێکدا بۆ دانانی پاره بڕیارنامه به‌ستن ‹رفتم بانک حساب باز کردم: چووم بۆ بانک حه‌ساوم کردەوه› ۲. حه‌ساب دانان؛ له‌گه‌ڵ که‌س یان دامه‌زراوه‌یه‌کدا سه‌ودا و مامه‌ڵه‌ی به‌رده‌وام و درێژخایه‌ن ده‌س‌پێکردن ‹پیش بقال حساب باز کرده است: له لای دووکانداره‌که‌وه حه‌سابی داناوه›.

**حساب بردن از کسی:** *[مجازی]* کۆکردنه‌وه له که‌سێک؛ بۆ هێز و که‌سایه‌تی که‌سێک بایه‌خ دانان ‹مرد بانفوذی است، همه از او حساب می‌برند: پیاوێکی ده‌سچووه، هه‌موو کۆی لێ ده‌که‌نه‌وه›.

**حساب پس دادن:** ۱. حیساب دانه‌وه؛ ئاراسته‌کردنی سیاهی ته‌واوی چالاکیگه‌لی ماڵی (وه‌ک سه‌ندن و فرۆتن و داهات و...) ۲. *[مجازی]* حیساب دانه دواوه؛ له لایه‌ن لێپرسراوه‌یه‌که‌وه که‌وتنه به‌ر پرسیار ‹همین‌طوری که نیست، فردا باید حساب پس بدی: خۆ هه‌یکۆ نیه، له کاتی خۆی ده‌بێ حیساب بده‌یته دواوه›.

**حساب تراشیدن:** حسابسازی کردن ☜ **حسابسازی**

**حساب چیزی را داشتن:** ۱. حه‌ساوی شتێ به ده‌سته‌وه بوون؛ هه‌ند و چه‌ندی شتێ زانین ‹حساب پولی را که خرج می‌کنی داشته باش!: حه‌ساوی ئه‌و پاره‌ی خه‌رجی ده‌که‌ی به‌ده‌سته‌وه بێ!› ۲. وریا بوون ‹حساب کارت را نداشتی، اینطور شد: وریای کاری خۆت نه‌بووی، ئاوای لێهات›.
هه‌روه‌ها: **حساب دست کسی بودن**

**حساب چیزی را کردن:** بیر له شتێ کردنه‌وه؛ حسێبی شتێ کردن ‹حساب این را بکن شاید فردا بیکار شدی: بیر له‌وه بکه‌وه هاتوو دوارۆژ بێکار بووی›.

**حساب خود را با کسی صاف کردن:** با او تسویه حساب کردن ☜ **تسویه**

**حساب داشتن:** حیساب هه‌بوون: ۱. به ئه‌ندازه بوون ‹این پولها حساب دارد: ئه‌م پاریانه حیسابی هه‌یه› ۲. له ڕووی حیسابه‌وه بوون؛ چه‌ند و چۆن هه‌بوون؛ ته‌کووز بوون؛ دۆزه‌نه‌دار بوون ‹دنیا حساب دارد: دنیا حیسابی هه‌یه› ۳. (له‌گه‌ڵ که‌س یان جێگایه‌ک) مامه‌ڵه کردن ‹من در این بانک حساب دارم: من له‌م بانکه حیسابم هه‌یه› ٤. قه‌رزدار یان قه‌رزگری که‌س یان جێگایه‌ک بوون ‹بگو اینجا حساب مختصری دارند، تشریف بیاورند تسویه کنند: بێژه له‌یره ورده حیسابیکیان هه‌یه، با ته‌شریف بێنن پاکی که‌ن›.

**حساب دست کسی آمدن:** *[مجازی]* ۱. مه‌زه‌نه هاتنه ده‌ستی که‌سێک؛ له چۆنیه‌تی کار ئاگادار بوون ‹خواستم حساب دستم بیاید، ببینم برای این کار چقدر سرمایه لازم است: ویستم مه‌زه‌نه بێته ده‌ستم، بزانم بۆ ئه‌م کاره چه‌نده ده‌سمایه پێویسته› ۲. ته‌مێ بوون؛ فامین. هه‌روه‌ها: **حساب دست کسی بودن**

**حساب دو- دوتا چهارتا بودن:** *[مجازی]* وه‌ک رۆژ ڕوون بوون؛ ساکار و سه‌لماو بوون ‹چرا نمی‌فهمی؟ حساب دو- دوتا چهارتا ست: چۆن تێناگه‌ی؟ وه‌کوو ڕۆژ ڕوونه›.

**حساب کار خود را کردن:** *[مجازی]* سێ و دووی خۆکردن ‹وقتی شاه فرار کرد، درباریان همه حساب کارشان را کردند و هرکدام به گوشه‌ای گریختند: کاتێ که شا ده‌رچوو، ده‌رباریه‌کان سێ و دووی خویان کرد و هه‌رکام به لایێکدا هه‌ڵاتن›.

**حساب کردن:** حیساب‌کردن: ۱. حه‌ساو کردن ‹دخل و خرجش را حساب کرد: دخڵ و خه‌رجی حه‌ساوکرد› ۲. شماردن؛ هه‌ژمراندن؛ ژمارتن ‹تعداد مسافران را حساب کن!: ژماره‌ی مسافره‌کان حیساب که‌!› ۳. دانان ‹او را آدم مهمی حساب می‌کردند: به که‌سێکی بایه‌خداریان

دادەنـا› ٤. نرخـی شـت یـان کارگـەلێک حەساوکردن ‹پول شام ما را هم حساب کرد: پارەی شێوەکەشمانی حیساب کرد›. هەروەها: **حساب شدن**

**حساب کسی با کرام‌الکاتبین بودن:** *[مجازی]* مەگەر خودا فریای کەسێ کەوتن؛ داهاتووی کەسێ شڕ بوون؛ کەوتنە ڕێی نەهات؛ بە بار و دۆخ و داهاتوویەکی نەدیار و (زۆرتر) خراپەوە بوون ‹اگر بخواهی اینطور زندگی کنی، آن‌وقت حسابت با کرام‌الکاتبین است: ئەگەر بتەوێ ئاوەها بژیت، ئەوجار مەگەر خودا فریات کەوێ›.

**حساب کسی پاک/ درست بودن:** *[مجازی]* حیسابی کەسێک پاک/ ساف/ دروست بوون؛ دروستکار بوونی کەسێک؛ درووسکار بوون.

**حساب کسی را بستن:** حیسابی کەسێک بەستن؛ بە مامڵە و سەودا لەگەڵ کەسێکدا کۆتایی دان.

**حساب کسی را رسیدن:** *[مجازی]* چاری دەردی کەسێک کردن؛ بە دەور کەسێکا هاتن؛ کەسێک تیمار یان تەمێ کردن ‹صبر کن، امشب حساب تو را می‌رسم: ڕاوەستە، ئەمشەو چاری دەردت دەکەم›. هەروەها: **به حساب کسی رسیدن**

**حساب کسی را کردن:** بۆ کەسێ بژاردن؛ حیسابی کەسێ کردن؛ حەساو کەسێ کردن: ١. قەرزی کەسێ دانەوە ‹ارباب حساب ما را بکن، می‌خواهیم برویم: ئاغا بۆمانی ببژێرە، دەمانەوێ بڕۆین› ٢. ڕەچاوکردنی کەسێ؛ لەبیر نەچوونی کەسێک؛ کەسێک لەبیردا بوون ‹حساب آزاد را هم بکن که ممکن است رضایت ندهد: حەساو ئازادیش بکە ڕەنگە ڕازی نەبێ›.

**حساب کشیدن از کسی:** حەساو لە کەسێ کێشانەوە: ١. بە سەر حیسابی سەودا و مامڵەی کەسێکدا هاتنەوە، بۆ ئاگادار بوون لە دروستیەکەی ‹هر شب از نوکرش حساب می‌کشد: هەموو شەوێک لە نۆکەرەکەی حیساب دەکێشێتەوە› ٢. لە کەسێک سەبارەت بە کارەکانی پرسینەوە ‹این کارها را که می‌کنی، فردا از تو حساب می‌کشند: کە ئەم کارانە دەکەی، سبەینێ حەساوت لێ دەکێشنەوە›.

**حساب نداشتن:** ١. لە ژمارە نەهاتن؛ بێ‌حەساو بوون؛ بێ‌ئەندازە بوون؛ لە ئەنازە بە دەربوون ‹ثروتش حساب ندارد: داراییەکەی لە ژمارە نایەت› ٢. سەرە و بەرە نەبوون؛ بێ سەرە و بەرە بوون ‹کارشان حساب ندارد: کاریان سەرە و بەرەی نیە› ٣. حیساب نەبوون؛ حەساو نەبوون؛ (لەگەڵ کەسێ یان جێگایەک) سەودا نەبوون ‹من در آن بانک حساب ندارم: من لەو بانقە حەساوم نیە› ٤. حیسابێک نەبوون؛ (بە کەس یان جێگایەک) قەرزدار یان داواکار نەبوون ‹من با او حسابی ندارم: لە گەڵیدا حیسابێکم نیە›.

**بە حساب آوردن:** بە حیساب هێنان؛ وە حەساو هاوردن: ١. حەساوکردنەوە؛ لە شماردندا ڕەچاوکردن ‹هزینەی حمل را دوبار به حساب آورده بودید: پارەی گوێزانەوەکەتان دووجار بە حیساب هێنابوو› ٢. حسێب کردن؛ هێنانە کایەوە؛ بە گرنگ زانین؛ بایەخ پێدان ‹از حالا دیگر او را هم باید به حساب آورد: لە ئێستاوە ئەبێ ئەویش حسێب بکەی›.

**به حساب کسی رسیدن** ☜ **حساب کسی را رسیدن**

**به حساب کسی گذاشتن/ نوشتن:** پای کسی نوشتن/ گذاشتن ☜ **پا**[1]

**حسابان** / hesābān/: [عربی]/اسم. حیسابان؛ چەند ڕەوشتی سەرەکی بیرکاری وەکوو: ئەنتیگراڵ و دیفرانسیێل.

**حسابدار** / hesābdār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. ژماریار؛ ژمێریار؛ حیسابدار؛ حیسابگەر؛ دەخلدار؛ خێڤزان؛ هساویەر؛ کەسێ کە کاری

تۆمارکردن و پاراستنی حەسابی مەزرینگە یان بەشێکی ئەویٚ بیٚ.

**حسابداری** / hesābdārî/: [عربی/ فارسی]/سم. ژماریاری؛ ژمێریاری؛ خێڤزانی: ۱. /ـها/ بەشیٚ لە مەزرینگە کە بە حیسابەکاندا ڕادەگا و تۆماریان دەکا ‹فرستادیم حسابداری چک بنویسند: ناردوومانەتە ژماریاری چەک بنووسن› ۲. کاری نووسین و ڕاگرتنی حیسابی دامەزراوەیەک ‹حسابداری صنعتی: ژماریاری پیشەیی› ۳. خولی ڕاهێنانی ژماریار بۆ کاری ژماریاری.

▣ **حسابداری دولتی**: ژماریاری دەوڵەتی؛ لقیٚ لە ژماریاری کە کاری، نووسین و پاراستن و پێداچوونەوەی حیسابی دامەزراوەیەکی دەوڵەتیە.

**حسابداری صنعتی**: ژماریاری پیشەیی؛ کار و ڕەوتی نووسین و پیٚڕاگەیشتنی ژمارە و بایی بەرهەم و قازانج یان زەرەری دامەزراوەیەک.

**حسابرس** / hesābras، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /سم. کەسیٚ کە بە سەر حیسابی دامەزراوەیەک و پەڕاوەکانیدا دێتەوە.

**حسابرسی** / hesābrasî، ـها/: [عربی/ فارسی]/سم. ۱. بەشێک لە دامەزراوەیێ کە بە حیسابی خۆی یان دامەزراوەگەلی تر ڕادەگا ۲. تاوتویٚ کردنی بەڵگەی مالی بە تایبەت بەڵگەی حیساب و ژماریاری دامەزراوەیەک، لە ڕوانگەی لە ڕوانگەی دروستی یان بەڵگەدار بوونیانەوە.

**حسابسازی** / hesābsāzî، ـها/: [عربی/ فارسی] /سم. حیسابتاشی؛ کار یان ڕەوتی ڕیٚک کردنی ڕیزی حەسابگەلی ناڕاست و هەڵشێواو (بۆ قەرزدار نیشاندانی کەس یان بەشدارگەیەک و دەرچوون لە ژێر پیتاک و کاری ناڕەوای دیکە) ‹معلوم شد مدیرعامل با کمک حسابدار برای شرکا حسابسازی کرده است: دەرکەوت کە بەرپرس بە یارمەتی ژماریارەکەی بۆ شەریکەکان حیسابتاشی کردووە›. هەروەها: **حسابسازی کردن**

**حسابگر**[1] / hesābgar، ـها/: [عربی/ فارسی]/سم. *[نامتداول]* پێژمێر؛ ماشینحەساب؛ حەسێبگەر.

**حسابگر**[2]: *صفت.* حەساوزان ‹او خیلی حسابگر است و تا کاری برایش سود نداشته باشد قدم پیش نمی‌گذارد: ئەو زۆر حەساوزانە و تا کارێک قازانجی بۆی نەبیٚ دەستی بۆ نابا›. هەروەها: **حسابگری**

**حساب‌وکتاب** / hesāb-o-ketāb/: [عربی]/سم. هۆرتەوبەرە؛ حەسێبوکتێب؛ حەساوـکتاو: ۱. دۆزەنە؛ ڕیٚکوپێکی؛ سەرە و بەرە ‹خیال نکن دنیا بی حساب‌وکتاب است: وا مەزانە دنیا بیٚ هۆرتەوبەرەیە› ۲. حیسابی پێوەندیدار بە سەودا و مامڵە، خەرج و داهات یان قەرزداری و قەرزدەریەوە ‹یک روز بنشین به حساب‌وکتابها برس و وضع خودت را روشن کن!: ڕۆژیٚ دانیشە و حسێب و کتێبی خۆتبکەو بزا لە چ حالدای!›.

**حسابی**[1] / hesābî/: [عربی] *صفت.* حیسابی؛ حەساوی: ۱. پڕبەپڕ؛ پەڕبەپەڕ؛ خاوەن بار و دۆخ یان تایبەتمەندیەک لەبار و شیاو ‹کار حسابی؛ جای حسابی: کاری حەساوی؛ جێگای حیسابی› ۲. پێوەندیدار بە حیسابەوە.

**حسابی**[2]: *قید.* باش؛ خاس؛ تێر و تەسەل؛ بە تەواوی؛ بە تواوی؛ سەرپاک؛ بە چەشنی تەواو یان چەندی زیاد ‹حسابی خوردیم: باشمان خوارد›.

**حسادت** / hesādat, hasādat، ـها/: [عربی]/سم. ئێرەیی؛ بەخێلی؛ دەخس؛ دەخسۆ؛ موود؛ هاڤیژی؛ کار یان ڕەوتی ئێرەیی بردن.

▣ **حسادت کردن**: ئێرەیی بردن؛ بەخێلی کردن ‹اگر به یکی از بچه‌هایت بیشتر توجه کنی، بقیه حسادت می‌کنند: ئەگەر بە منداڵێکت زۆرتر بایەخ بدەی، ئەوانیتر ئێرەیی دەبەن›.

**حساس** / hassās/: [عربی] *صفت.*هەستۆک؛ هەستیار؛ هەستکار: ۱. هەستەوەر؛ خاوەن کاردانەوە لە هەمبەر هۆگەلی دەرەکیەوە ‹کاغذ حساس: قاقەزی هەستۆک› ۲. هەستەوەر؛ قوت؛ قوتە؛ قچ؛ لە سەر هەست ‹گوش حساس: گوێی

هەستوک› ۳. /ـها/ دڵنازک؛ دڵناسک ٤. گرینگ؛ گرنگ؛ خاوەن بایەخداری و شیاوی سەرنج دان ‹شغل حساس؛ موقعیت حساس: پیشەی گرنگ؛ جێگای هەستوک›. هەروەها: **حساس بودن؛ حساس شدن؛ حساس کردن**

**حساسیت** / hassāsîyyat، ـها/: [عربی]/اسم. هەستۆکی؛ هەستکاری؛ هەستیاری: ۱. هەستەوەری؛ قچیەتی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی هەستەوەر بوون ‹حساسیت زیاد هم خوب نیست: هەستۆکی زۆریش باش نیە› ۲. هەستەوەری؛ هەبوونی کاردانەوەی زۆر لە بەرانبەر هۆی دەرکیەوە ‹حساسیت این فیلمها زیاد است: هەستۆکی ئەم فیلمانە زۆرە› ۳. حەساسیەت؛ ئالیرژی؛ جۆرێ ناکۆکی لەشە ‹بە باقالی حساسیت دارد: لە بەرامبەر باقلەوە حەساسیەتی هەیە›.

**حسب‌الامر** / hasabol'amr/: [از عربی] حرف. بەپێی فەرمان؛ بەپێی دەستوور ‹حسب‌الامر رییس جمهور هیئتی به آنجا اعزام شد: بە پێی فەرمانی سەرۆک کۆمار دەستەیەک ناردران بۆ ئەوێ›.

**حسب حال** / hasabehāl/: [عربی]/اسم. [ادبی] باسی حاڵ و باڵ؛ بە تایبەت نووسین و ڕاڤە کردنی چۆناوچۆنی بەسەرهاتی خۆ.

**حسب و نسب** / hasab-o-nasab/: [عربی] /اسم. [ادبی] ڕەگەز؛ بنیچە؛ بنەچەکە؛ ڕەچەڵاک؛ تۆرەمە؛ نەژاد؛ ڕەتەوە؛ بنج و بناوان.

**حسد** / hasad/: [عربی]/اسم. [ادبی] ئێرەیی؛ بەخێلی: ۱. تەشەنە هێنان لە بەرانبەر سەرکەوتن و خۆشی دیترانەوە یان دوژمنایەتی کردن لە حاندی کەسانێکدا کە بەرز و بەرچاون ۲. هەستی بە ئی خۆ زانین یان پاوان کردنی ئەوین، خۆشەویستی و ئەمەگداری نزیکان (وەک هاوسەر، دڵبەر، دایک، فرزەن، خوشک و برا) و دڵ ئێشان لە بایەخدانی ئەوان بە کەسانیتر.

◘ **حسد بردن/ ورزیدن:** ئێرەیی بردن؛ بەخێلی کردن ‹به حافظه‌اش حسد بردم: بە بیری ئێرەییم برد›.

**حسدورزی** / hasadvarzî، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. ۱. دۆخ یان چۆنیەتی ئێرەیی بردن؛ بەخێڵ بوون ۲. ئێرەیی؛ بەخێلی؛ دەخس؛ دەخسۆ؛ موود؛ هاڤیژی؛ کار یان ڕەوتی ئێرەیی بردن.

**حسرت** / hasrat، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. سۆ؛ سوێ؛ سووی؛ سوو؛ تاسە؛ ئەفسۆس؛ کەلیلان؛ داخ؛ عەزرەت؛ داخ و کەسەر بۆ شتێ کە لە بەر دەست نیە ‹سالها در حسرت آزادی بود: زۆر ساڵان لە سۆی ئازادیدا بوو› ۲. داخ؛ خەفەت؛ ئاواتی بەدی نەهاتوو ‹حسرت به دلم ماند یک روز تو را با لباس مرتب ببینم: داخی بە دڵمەوە ما ڕۆژێکیان بە جلوبەرگی ڕێک و پێکەوە بتبینم›.

◘ **حسرت بردن:** ئاخ هەڵکێشان؛ بە ئاواتی شتێ دوورەدەسەوە بوون ‹حسرت می‌بردم که کاش به جای او می‌بودم: ئاخم هەڵدەکێشا بریا لە جێی ئەو بوومایە›.

**حسرت به دل ماندن:** داخ بە دڵەوە مان؛ بە داخەوە داکەوتن؛ ئاوات نەهاتنە دی.

**حسرت خوردن:** ئاخ هەڵکێشان؛ داخ لێهاتن؛ کول داکرن؛ خەم خواردن؛ هەژان و هەڵچوون لە حەیفان؛ لە ئاواتی شتێکا بوون ‹حسرت روزهای جوانی را می‌خورد: بۆ ڕۆژانی لاوی ئاخ هەڵدەکێشی›.

**حسرت کشیدن:** بەئاوات بوون؛ ئاخ هەڵکێشان؛ لە خەمی نەگەیشتن بە ئاواتێکدا تلانەوە ‹حسرت روزی را می‌کشید که بتواند در کنار فرزندش باشد: بەئاواتی ڕۆژێک بوو بتوانێ لای منداڵەکەیەوە بێ›.

**حسرت‌الملوک** / hasratolmolûk, -mulûk/: [عربی] ☜ **جَغوربَغور**

**حسگر** / hesgar، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. دەنگدەر؛ سێنسۆر؛ ئامێرێ کە لە بەرانبەر دیاردەگەلی دیاریکراوی فیزیکیەوە (وەک

تیشک، گەرما و سەرما) ئەکەوێتە کار و ئەبێتە هۆی پێزانینیان.

**حسگیری** / hesgîrî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* هەستگری؛ دۆخ یان چۆنیەتیەک کە لە سۆنگەی ئەوەوە نووسەر یان هونەرەوەر بتوانێ خۆی لە جێی کەسایەتیەک دانێ، وا بکا کە کەسێکی وا لەو بار و دۆخەدا دەیکا.

**حسن** / hosn ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. چاکی؛ باشی؛ خاسی ‹حسن عمل: چاکی کردەوە› ۲. جوانی؛ خوشیکی؛ شەنگ و تەرزی ‹حسنت به اتفاق ملاحت جهان گرفت: جوانیت لە هەموو بارەوە دنیای داگرت›.

▣ **حسن اخلاق:** خۆشخۆیی؛ ئاکارباشی/ چاکی؛ خدەپەسندی.

**حسن استفاده:** کەلکوەرگری چاک/ باش.

**حسن انتخاب:** باش هەڵبژێری؛ هەڵبژاردەی چاک؛ بژاردەی جوان.

**حسن تأثیر:** باش کارتێکەری؛ کارتێکەری چاک.

**حسن تدبیر:** باش ڕاوێژی؛ ڕاوێژی چاک.

**حسن تشخیص:** باشناسی؛ ڕەوتی لێکدانەوەی چاک؛ ناسینەوەی باش یان دروست.

**حسن تصادف:** هەڵکەوتی چاک.

**حسن تفاهم:** ڕەوتی چاک لێکگەیشتن؛ چاک هەڤگهان.

**حسن تلقی:** بۆ چوونی باش.

**حسن توجه:** ڕەوتی باش پێڕاگەیشتن.

**حسن جریان:** ڕەوتی باش.

**حسن ختام:** ئاکامی چاک؛ ڕەوتی کۆتایی هاتنی باش و بە خۆشی؛ دوایی هاتنی چاک.

**حسن خط:** خۆشنووسی؛ جوان نووسی.

**حسن خلق:** ڕووخۆشی؛ خۆشخۆیی؛ خدەپەسندی.

**حسن رفتار:** ئاکار چاکی؛ ئاکار جوانی.

**حسن روابط:** پێوەندی چاک/ باش.

**حسن سابقه:** پێشینەی چاک/ باش.

**حسن سلوک:** هەڵسوکەوتی چاک/ باش؛ ڕێوشوێنی چاک.

**حسن شهرت:** ناو بەرزی؛ ناو چاکی؛ خۆشناوی.

**حسن طلب:** *[بدیع]* هونەری داوا کردنی شتێک لە کەسێکیتر بە چەشنێکی جوان.

**حسن ظن:** گەشبینی؛ خۆشبینی.

**حسن عمل:** دروستکاری؛ درووسکاری؛ کردەوەی چاک.

**حسن نظر:** بیر و ڕای چاک.

**حسن نیت:** خێرخوازی؛ بەرگ و نیازی باش.

**حسن همجواری:** دراوسێ داری؛ هاوسێ دۆستی؛ هەڵسوکەوتی دۆستانە لەگەڵ هاوسێدا.

▣ **حسن داشتن:** باشی هەبوون؛ چاکی هەبوون؛ چاک بوون؛ خاس بوون؛ باش بوون؛ خاس بیەی ‹آن خانه هیچ حسنی نداشت، جز اینکه ارزان بود: ئەو ماڵە هیچ باشیەکی نەبوو، جگە لەوە هەرزان بوو›.

**حسنات** / hasanāt/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. *[نامتداول]* چاکیگەل؛ باشیگەل؛ خاسیگەل ۲. چاکە؛ کاری باش.

**حسن لبه** / hasanlabe/: [از عربی] *اسم.* هەنگویژە؛ هەنگوژە؛ جەوی؛ ماکێکی بۆنخۆشە کە لە قەڵشی کۆتەرەی برێ دارەوە دێتە دەرە و لە عەترسازی و بژیشکیدا بەکار دێ.

**حسن یوسف** / hosneyûsef ، ـها/: [عربی/ عبری] *اسم.* گوڵەمەخمەلی؛ چاڤڕەشۆک؛ گوڵێکی جوان لە بنەماڵەی ڕێحان کە بە بۆنەی جوانی و ڕەنگامەیی گەڵاکانیەوە لە گوڵدان ڕادەگیرێ.

**حسود** / hasûd ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* بەرچاوتەنگ؛ چاوتەنگ؛ چاوچنۆک؛ چاڤچنۆک؛ چاڤینۆک؛ چنۆک؛ چەکەسوو؛ چەکهەسوو؛ چاونەزێر؛ درژ؛ گاڤبەر؛ بەئێرەیی

‹زری خیلی حسود است: زەڕی زۆر بەرچاوتەنگە›.
**حاسد** *[ادبی]*

**حسودی** / hasûdî/: [عربی]/*اسم*. چاوتەنگی؛ بەرچاوتەنگی؛ ئیرەیی؛ بەخیلی؛ گاڤبەری؛ هەلکالسینی؛ درژی؛ چنۆکی؛ چکووسی؛ چاونەزێری.

▣ **حسودی کردن**: ئیرەیی بردن؛ بەخیلی/ چنۆکی/ درژی کردن ‹خوب نیست حسودی برادرت را بکنی: باش نیە ئیرەیی بە براکەت بەری›.

**حسی** / hessî/: [عربی] *صفت*. ۱. هەستی؛ پێوەندیدار یان سەر بە هەستەوە؛ بەرانبەری ئاوەزی ۲. هەستکراو؛ هەستپێکراو.

**حسینیه** / hoseynîyye، ـها/: [عربی]/*اسم*. حوسەینیە؛ حسەینیە؛ جێگایەکی مزگەوت ئاسایە بۆ بەرێوە بردنی ئازیەتباری، بەتایبەت تازیەباری حەزرەتی حوسێن لە لایەن موسولمانانی شیعەوە.

**حشر** / hašr/: [عربی]/*اسم*. *[ادبی]* پەسلان؛ نیروانا؛ نیرڤانا؛ قیامەت؛ رۆژی پەساتێ؛ رۆژی مەحشەر ‹روز حشر: رۆژی پەسلان›.

**حشرات** / hašarāt/: [عربی] /*اسم*. ۱. جمعِ ☜ **حشره** ۲. مێرووان؛ زیندەوارە؛ دەستەیەک لە گیانەوەرانی وشکەژی بریەتی لە: مێش، مێشوولە؛ مێروولە، کولە، پەپوولە، هەنگ، زەرگەتە، دووپشک، قۆلانچە، جالجالۆکە و... کە زۆربەیان خاوەنی دوو جووتە باڵ و جووتێک شاخەکە و سێجووتە پای برکەبرکەن و لەشیان لە سێ بەشی جیاوازی سەر و سینە و زگ پێکهاتووە.

**حشر و نشر** / hašr-o-našr/: [عربی]/*اسم*. هەڵسوکەوت؛ هاتوچوو؛ ئامشەورەفت؛ ئامەولوەی؛ هۆرزونیشت؛ هەڵسودانیشت ‹باید با آنها حشرونشر کنی تا خوب بشناسیشان: ئەبێ لەگەڵیاندا هەڵسوکەوتت هەبێ تا چاک بیانناسی›.

**حشره** / hašare، ـها؛ حشرات/: [عربی]/*اسم*. مێروو؛ گەناوەر؛ گەناور؛ زیندەوارە؛ دەعبا؛ جڕ و جانەوەر؛ جانەوەری وردیلە؛ حەشەرە.

**حشرەخوار** [1] / hašarexār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. گەناوەرخۆر؛ مێرووخۆرە: ۱. ڕووەکی وا کە داوێکی بۆ مێروو خواردن بێ ۲. *[جانورشناسی]* ناوی گشتی هەر گیانەوەرێک کە مێروو دەخوا.

**حشرەخوار** [2]: *صفت*. مێرووخۆر؛ گەناوەرخۆر؛ بە تایبەتمەندی یان خووی خواردنی مێرووەوە ‹گیاه حشرەخوار؛ مرغ حشرەخوار: ڕووەکی مێرووخۆر؛ باڵندەی گەناوەرخۆر›.

**حشرەشناسی** / hašarešeāsî/: [عربی/ فارسی] *اسم*. گەناوەرناسی؛ مێرووناسی؛ لقێ لە زانستی زیندەوەرناسی تایبەت بە خوێندنەوەی زانستی لە سەر گەناوەر. هەروەها: **حشرەشناس**

**حشرەکش** [1] / hašarekoš، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. گەناوەرکوژ؛ مێرووکوژ؛ هەر یەکە لەو ماکە ژەهراویانە کە بە شێوازی گەرد، تراو یان گاز، بۆ لە بەین بردنی مێروو و مێملی ڕووەک بە کار ئەبرێ.

**حشرەکش** [2]: *صفت*. مێرووکوژ؛ گەناوەرکوژ؛ بەتایبەتمەندی یان توانای کوشتنی مێروو.

**حشری** / hašarî، ـها/: [عربی] *صفت*. زەنەکحەشەری؛ حەکەدار؛ هەکەدار؛ بەئالۆش؛ هەیشۆ؛ بە تینوویەتی زۆرەوە بۆ سەرجێیی کردن.

▣ **حشری شدن**: زەنەک/ حەکەدار/ حەشەری بوون؛ حەکەدار بوون.

**حشفه** / hašafe/: [عربی]/*اسم*. سەرەی ئەندامی زا و زێی پیاو.

**حشم** / hašam/: [عربی]/*اسم*. ۱. دەس‌وپا؛ پشتمێر؛ دەس و پێوەند؛ بەردەستان؛ ژێردەستان و دەوروبەری کەسێ خاوەن دەسەلات ۲. /احشام/ ڕان؛ ڕانەمەڕ؛ شەگەلە.

**حـشمت** / hešmat/: [عربی]/اسم. شکۆداری؛ خاوەنشکۆیی؛ هشگە: ۱. بار و دۆخی ڕەخساو لە هەبوونی خزمەتکار و ژێردەستانی زۆر و هەموو جۆرە ۲. ڕێز و شکۆی بەرهەمی ئاوەها دۆخێک.

**حشمداری** / hašamdārî/: [عربی/ فارسی]/اسم. مەڕداری؛ ئاژەڵداری؛ دەوڵەتداری؛ گەلەداری؛ شەگەلەداری.

**حـشو** / hašv ، ـها/: [عربی]/اسم. [بدیع] زێدە؛ وتەیەک کە لە نێو وتارێکدا بۆ خەملاندن یان ڕاڤەیەکی زۆرتر بە کار دەڕوا.

▣ **حـشو قبـیح**: زێدەی دزێو؛ زێدەیەک کە هێنانی لە نێو وتاردا پێویست نیە و لە جوانی وتار کەم دەکاتەوە.

**حشو ملیح**: زێدەی جوان؛ زێدەیەک کە وتە جوان دەکا.

**حـشیش** / hašîš/: [عربی]/اسم. حەشیش؛ حەشیشە؛ بەنگ؛ چەرس؛ گیایەکە دەیکێشن و پێی گێژ و سەرخۆش دەبن.

▣ **حـشیش کـشیدن**: حەشیشکێشان؛ بەنگ کێشان؛ چەرسکێشان.

**حصار** / hesār ، ـها/: [عربی]/اسم. بارش؛ وارش؛ پەرژین؛ پەرچین؛ باروم؛ پاوان؛ سوور؛ شوورە؛ شوورا؛ شوواروو؛ لەمپەرێ لە چێو، بەرد، کەرپووچ یان تەلی دڕکاوی کە لە پەڕانپەڕی شوێنێکەوە چێ دەکرێ ‹جالیز حصار نداشت و میشد وارد آن شد: بێسانەکە بارشی نەبوو، دەکرا بڕۆیتە نێویەوە›.

▣ **حصار کشیدن**: بارش لێدان؛ پەرژین کردن/ دانان ‹دور باغ حصار کشیدند تا افراد غریبه وارد آن نشوند: دەوری باخەکەیان بارش لێدا غەراوەی تێ نەچێ›.

**حـصبه** / hasbe/: [عربی]/اسم. کەوتوویی؛ کەفتەیی؛ حەسبە؛ سیەتا؛ تاوی ڕیخۆڵە؛ نەخۆشینێکی چلکی گیرۆیە کە زۆرتر لە ڕێگای خواردنی چێشت، شیر و ئاوی پیسەوە تووش دەبێ و ئەبێتە هۆی یاو، زگەشۆرێ، بێحاڵی، سەرئێشە و ماسینی هەرتک ڕیخۆڵەوە.

**حصر** / hasr/: [عربی]/اسم. [ادبی] ۱. وارش؛ پاوان ۲. گەمارۆ؛ ئابڵۆقە ‹حصر اقتصادی: گەمارۆی ئابووری› ۳. پاوانکاری؛ پاوانی ‹حصر وراثت: پاوانی میرات›.

▣ **حصر وراثت**: پاوانی میرات؛ دیاری کردنی میراتبەرانی مردوو بۆ دابەش کردنی میرات بە سەر هەموویاندا.

**حصن** / hesn/: [عربی]/اسم. [ادبی] دژ؛ پەناگا؛ جێگایەکی وا کە بکرێ تێیدا پەنا بگری ‹حصن حصین: پەناگای پتەو›.

**حـصول** / husûl, hosûl/: [عربی]/اسم. [ادبی] دەسکەوت؛ دەسکەفت؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەدەستهێنان ‹کار را تا حصول نتیجه دنبال کنید: بە دوای کارەوە تا دەسکەوتی ئاکام بڕۆن›.

**حصه** / hesse ، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] بەش؛ بەشە؛ پاژ؛ باهر؛ سەری: ۱. پار؛ لۆتم؛ لەقا؛ بەشێ لە شتێک ‹حصهای از پول هم به من رسید: بەشێ لە پارەکەیش بە من گەیشت› ۲. گوێچ؛ گیهەڤ؛ بەهر؛ بەر؛ هۆخ؛ پشک؛ بێش؛ بەشی هەر کەس لە شتێ کە لە بەینیاندا بەش دەکرێ ‹آرام حصهاش را به آزاد داد: ئارام بەشەکەی خۆی دا بە ئازاد›.

**حـصیر** / hasîr ، ـها/: [عربی]/اسم. حەسیر؛ حەسیل؛ حەسیلک؛ هەسیر؛ هەشیر؛ بووریا؛ ڕایەخێ لە جەگەن و قامیش یان زەل.

**حصیرباف** / hasîrbāf ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. حەسیرچن؛ وەستای حەسیر دروستکردن.
هەروەها: **حصیربافی**

**حـصیری** / hasîrî/: [عربی] صفت. حەسیری؛ هەسیری؛ هەشیری؛ بوورپایی: ۱. لە چەشنی حەسیر ‹کلاه حصیری: کڵاوی حەسیری› ۲. خاوەن بافت و نەخشی وەکوو حەسیر.

**حصین** / hasîn/: [عربی] *صفت. [ادبی]* پتەو؛ پایەدار؛ تۆکمە؛ پەیت؛ ئەستەم؛ هەسەم؛ قایم ‹حصن حصین: پەناگەی پتەو›.

**حضار** / hozzār/: [عربی]/*اسم.* دانیشتووان؛ ئامادەبووان؛ ئەوانەی لە مەجلیسدان ‹حضار برای سخنران کف زدند: دانیشتووان بۆ وتاربێژ چەپڵەیان لێدا›.

**حضارت** / hazārat, hezārat/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* شارستانێتی؛ شارستانیەتی: ۱. شارنشینی؛ ژیاری ۲. ژیار؛ شارستانیەت.

**حضانت** / hezānat/: [عربی]/*اسم. [حقوق]* سەرپەرشتی؛ بەخێوکری؛ پەروەردەکری؛ چاودێری و ئاگاداری لە منداڵ ‹دادگاه حق حضانت را از او سلب کرد: دادگە مافی سەرپەرشتی لێ سەندەوە›.

**حضر** / hazar/: [عربی]/*اسم.* هێبەر؛ بنەگا؛ بنەجێ؛ جێی ئامادە بوون یان نیشتەجێ بوون. بەرانبەر: **سفر**

**حضرات** / hazarāt/: [عربی] جمعِ ☜ **حَضرَت**

**حضرت** / hazrat ، ـها؛ حَضَرات/: [عربی]/*اسم.* حەزرەت؛ سەرناوێکە بۆ ڕێزگرتن کە لە پێش ناوی پیاوانی پیرۆز و گەورە پیاوان دەگوترێ.

▣ **حضرت اشرف** ☜ جناب اشرف، **جناب**

**حضرت عالی** ☜ **حضرتعالی**

**حضرتعالی** / hazarāt(e)'ālî/: [عربی] ضمیر. بەڕێزتان؛ ئێوەی بەڕێز؛ وشەی ڕێزگرتن بۆ بیسەری تاک ‹حضرتعالی حضور نداشتید: بەڕێزتان لەوێ نەبوون›.

**حضرت عباسی** / hazrat'abbāsî/: [عربی] *قید. [مجازی]* خۆتوخوات؛ خواوەکیلی؛ خواوەکیل؛ خوداوەکیلی ‹حضرت‌عباسی این را چند خریدی؟: خۆتوخوات ئەمەت چەند کڕیوە؟›.

**حضور** / huzûr, hozûr/: [عربی]/*اسم.* ۱. پێشگا؛ بارەگا؛ هەنتەش؛ دەرگانە؛ ئاسانە؛ بەردەم ‹در حضور دادگاه: لە پێشگای دادگادا› ۲. هەبوون؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی بوون لە جێگایەکدا. بەرانبەر: **غیاب** ‹حضور داشتن: هەبوون› ۳. تەیاری؛ لەباوی؛ بەرهەڤی؛ بار ‹حضور ذهن: بیر تەیاری›.

▣ **حضور ذهن:** بیریاری؛ بیر تەیاری؛ بیر لەباوی.

▣ **حضور به هم رسانیدن:** یەکگرتن؛ ئامادە بوون؛ بە یەک گەیشتن ‹در ساعت مقرر در جلسه حضور به هم رسانید: لە کاتژمێری ڕەچاوکراودا لە دانیشتنەکە یەک بگرن›.

**حضور داشتن:** بوون؛ هە بوون؛ ئامادە بوون؛ حازر بوون ‹پدرش هم حضور داشت: بابیشی بوو›.

**در جایی حضور یافتن:** لە شوێنێکدا ئامادە بوون؛ لە جێگایەک هەبوون ‹همەی پدر مادرها باید در مدرسه حضور یابند: هەموو باوک و دایکەکان ئەبێ لە قوتابخانە ئامادە بن›.

**به حضور کسی رفتن:** خزمەت کەسێ گەیشتن؛ ڕۆیشتن بۆ لای کەسێکی بەڕێز ‹به حضورشان رفتم تا کسب تکلیف کنم: خزمەتی گەیشتم تەگبیرێکم بۆ بکەن›.

**حضوراً** / huzûran, hozûran/: [عربی] *قید.* ڕووبەڕوو؛ ڕواوڕوو؛ لە بەرانبەر کەسێکدا ‹تقاضای خود را حضوراً بیان کردم: داخوازەکەم ڕووبەڕوو گوت›.

**حضوروغیاب** / huzûr-o-qîyāb, hozûr-/: [عربی]/*اسم.* بوون و نەبوون: ۱. بار و دۆخ یان چۆنیەتی بوون یان نەبوون لە شوێنێکدا ‹حضوروغیاب افراد در محل کار: بوون و نەبوونی کەسان لە سەر کاریاندا› ۲. کار یان ڕەوتی لێڕوانین بە سەر بوون یان نەبوونی کەسان لە شوێنێکدا.

**حضوری**[1] / huzûrî, hozûrî/: [عربی] *صفت.* ڕووبەڕوو؛ ڕواوڕوو؛ لە نزیک؛ خاوەن دۆخ یان چۆنیەتی لە بەرامبەر بوون ‹مذاکرەی حضوری: وتوویژی ڕووبەڕوو›.

**حضوری**[2]: *قید.* ڕووبەڕوو؛ ڕواوڕوو؛ لە ڕووبەڕوودا؛ دۆخ یان چۆنیەتی بوون لە جێگایەکدا. بەرانبەر:

له نزیکەوە ‹حضوری خواهم گفت: ڕووبەڕوو پێتانی ئێژم›.

**حضیض** / hazîz ، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] نشێو؛ نشیو؛ نشیف؛ نشووڤ؛ نەوی؛ نزم؛ نەزم. بەرانبەر: **اوج** ‹حضیض کوه: نشێوی کێو›.

**حطی** / hottî/: [عربی]/اسم. حوتتی؛ سێیەمین دەستەی پیتی ئەبجەد کە بریتین لە «ح؛ ط؛ ی».

**حظ** / haz(z) ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. حەز؛ خۆشی؛ خوەشی؛ کەیف ‹حظ کردم: حەزم کرد› ٢. [ادبی] بەهرە؛ بەش؛ بێر؛ باهر؛ بەخت ‹از هوش حظ وافری داشت: لە هۆش بەهرەیەکی باشی هەبوو›.

▣ **حظ وافر:** بەهرەی باش؛ بەشی زۆر؛ بەشی فراوان.

▣ **حظ بردن:** خۆش هاتن؛ کەیف کردن؛ وەش ئامەی ‹از این کار خیلی حظ بردم: لەم کارە زۆر خۆشم هات›.

**حظ داشتن:** خۆشی بوون؛ وەشی بیەی؛ بە قازانج بوون یان هۆی دڵخۆشی بوون ‹رفتیم ماهیگیری، برایم حظی نداشت: چووین بۆ ماسیگری، خۆشیەکی بۆم نەبوو›.

**حظ کردن:** کەیف کردن؛ خۆشحاڵ بوون؛ چێژ لێوەرگرتن ‹از تماشای بازیشان حظ کردم: لە تەمەشای کایەکەیان کەیفم کرد›.

**حفار** / haffār ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. هەڵقەن؛ هەڵکەن؛ کۆڵێنکار؛ کۆڵەر: ١. کۆڵەنگ؛ کۆڵەک؛ ماشینێ کە بۆ هەڵکەندن و خاک هەڵگرتن بە کار دەڕوا ٢. کەسێ کاری هەڵکەندن یان کەلاشتنی زەمینە.

**حفاری** / haffārî ، ـها/: [عربی]/اسم. هەڵکۆڵی؛ هەڵقەنی؛ هەڵکەنی؛ کۆڵەری: ١. کاری هەڵکۆڵین و چاڵ کردنی شتێ، بەتایبەت زەمین ‹خیابان را برای لوله کشی حفاری کردەاند: شەقامەکەیان بۆ لوولەکێشی هەڵکۆڵیوە› ٢. ڕەوتی کەندنی زەوی و گەڕان لە ژێر خاکدا ‹آنجا غیرمجاز حفاری شده است: ئەوێ بێقانوون کەنراوە›.

**حفاظ** / hefāz ، ـها/: [عربی]/اسم. پارێزەر؛ کەرەسەی پارازتن، بەتایبەت ئەوەی لە هاتنی هۆیەکی نەخوازراو بەرگری دەکات (وەک میچ، دیوار، وارش، نەردە و...).

**حفاظت** / hefāzat/: [عربی]/اسم. ١. پارێزگاری؛ ئاگاداری؛ نگاداری؛ نواداری ‹حفاظت اشیای قیمتی: ئاگاداری لە شتی بەنرخ› ٢. پاسەوانی؛ پاسگری؛ نواوانی ‹پیرمردی عهدەدار حفاظت از موزه بود: پیرەپیاوێک پاسەوانی لە ئەنتیکەخانەی لە ئەستۆ بوو›.

**حفر** / hafr/: [عربی]/اسم. هەق؛ کار و ڕەوتی کۆڵین؛ دانەوە؛ کەندن؛ کەنەی؛ هەڵکۆڵین، بەتایبەت زەمین ‹حفر چاە آب: هەقی بیر›.

▣ **حفر کردن:** هەڵکەندن؛ هەقاندن؛ هەڵکۆڵین؛ هەڵقەندن؛ هەڵقاندن؛ کۆڵین؛ دانەوە؛ هۆرکەنەی ‹زمین را برای پی‌سازی حفر کردند: زەمینیان بۆ بنەڕەت دانان هەڵکەند›.

**حفره** / hofre ، ـها/: [عربی]/اسم. چاڵ؛ قووڵکە؛ کەند؛ کەن؛ کەنەلان؛ کەندەلان؛ گەهر: ١. قووڵکە ‹برای نصب تیر حفرەای کندە بودند: بۆ دانانی تیرەکە چاڵێکیان کەندبوو› ٢. بۆشایی، کون یان چاڵی سەر شتێک ‹پای دیوار حفرەای بود کە موشها و مورچەها بە وجود آوردە بودند: لە پای دیوارەکەدا چاڵێک بوو مشک و مێرووڵە کەندبوویان›.

**حفظ** / hefz/: [عربی]/اسم. ١. نگا؛ هەممەت؛ کار یان ڕەوتی پاراستن و بەرگری‌کردن لە وەزەنگ ٢. [گفتاری] لە بەر؛ لبەر؛ وەر؛ ئەز بەر؛ ژبەر؛ دەرخ؛ کار یان ڕەوتی لە بەر کردنی شتێ ‹حفظ شعر: لەبەر کردنی شیعر›.

▣ **حفظ بودن:** لەبەر بوون؛ ئەزبەر بوون؛ ژبەر بوون؛ دەرخ بوون؛ وەر بیەی.

**حفظ شدن:** ١. پارێزران؛ پارێزیەی؛ نواداری بوون ‹وسایل او تماماً حفظ شدە بود: کەل‌پەلەکەی

به گشتی پارێزرابوو› ۲. لەبەر بوون؛ وەر بیەی ‹سه بار خواندم تـا خـوب حفـظ شـدم: سـێ جـارم خوێندەوه هەتا بـاش لەبـەرم بـوو›. هـەروەها: **حفظ کردن**

**از حفظ خواندن:** لەبـەر خوێندنـەوه؛ ئەزبـەر خوێندن؛ بەوەر وانەی؛ ژبەر خوێـندن ‹تمام شعر را از حفظ خواند: تەواوی شیعرەکەی لـە بـەر خوێندەوه›.

**حفـظالـصحه** /hefzossehhe/: [عربـی]/اسـم. [قدیمی] تەندروستی؛ لەشساغی.

**حفظـی**[1] /hefzî/: [عربـی] صفت. لەبـەرکردنی؛ لەبیر ڕاگرتنی ‹یک عالم درس حفظی دارم: زۆرێـک وانەی لە بەرکردنیم هەیە›.

**حفظی**[2]: قید. لەبەر؛ بەوەر؛ بە یارمەتی بیر ‹نالەی جـدایی را حفظـی خوانـد: نالـەی جـودایی لەبـەر خوێندەوه›.

**حق**[1] /haq(q)/، ـها: حقـوق/: [عربـی]/اسـم. حـەق: ۱. ماف؛ سەربەستیەک کە قانوون، عـورف یـان سروشت بـە کەسـێکی داوه ‹حـق نفس کـشیدن: مافـی هەناسە دان› ۲. مـاف؛ سەرپـشکایەتیەک کە بە هۆی ئەنجامدانی کارێکەوه بە کەس یـان دامەزراوەیەک دەدرێ ‹حق ثبت؛ حق بیمه: مافـی نووسـین؛ مافـی دابـین› ۳. [مجـازی] خـودا؛ ئافرێنـەر؛ یـەزدان؛ خولـقێنەر؛ وەدی هێنـەر؛ پەروەردگار.

◙ **حق آب و گل:** ۱. مافێ کە بەبۆنەی ئاوەدان کردنەوەی ملکێکەوه بۆ کەسـێک بـەدی دێ ۲. [مجازی] مافێ کە بەبۆنەی نیشتەجێ بوون بۆ ماوەیەکی زۆر لە جێگایەک و ئەنجامـدانی برێ کار لەوێدا، بۆ کەسێ بەدی دێت.

**حق اختراع:** مافی داهێنان؛ مافی کەسـێ بـۆ بەهره بردن لە داهاتی ئەو شتە وەدیهێناوه.

**حـق اشـتراک:** مـافی هاوبەشـی؛ ئابوونمـان؛ مزەی ساڵانە یان مانگانە بۆ شەریک بوون لـە کاڵا، ڕاژه یان هەر شتێکدا ‹حق اشتراک روزنامه؛ حق اشتراک برق: مافی هاوبەشـی ڕۆژنامـە؛ مـافی هاوبەشی کارەبا›.

**حق امتیاز:** مافی بەشداری؛ پارەیـەک کـە لـە بەرانبـەر سەرپـشکی دان بـە کـەس یـان دامەزراوەیەک، لێی وەرئەگیردرێ.

**حق انتفاع** ☜ **حق بهرەبرداری**

**حق انحصار:** پیتاکی؛ پارەیەک کە بـۆ بـەهره بردن لە کاڵای دەوڵەتی، دەوڵەت لە خەڵکی دەستێنێ.

**حق اولویّت:** مافی لەپێشی/ یەکـەمی؛ مافـێ کە بە بۆنەی پێشدەستی کردنی کەسێک لـە ئەنجامدانی کارێکدا پێی دەدرێ: **حق تقدّم**

**حق بهرەبرداری:** مافی دەسکەوتی؛ مافێ کـە بەو بۆنەوه کەسێک بتوانێ لە ماڵـێ کـە هـی کەسێکی دیکەیە یـان خـاوەنی نیـە کەڵـک وەرگرێ: **حق انتفاع**

**حق بیمه:** مافی دابین؛ پارەیەک کە کەسێ بۆ دابین بوون، بە بەشدارگەی بیمەی دەدات.

**حق پدری:** مافی باوکی: ۱. مافێ کە باوک لە بەرانبەر منداڵەوه هەیەتی ۲. ئەرکێ کە باوک بۆ بەجێ هێنانی ئەو مافە هەیەتی ۳. ئـەرکێ کە منداڵ بۆ ڕێزنان لە باوکی لەسـەر شـانیە. هەروەها: **حق مادری/ دوستی/ نان و نمک**

**حق تألیف:** مافی نووسین/ دانان؛ پارەیەک کە بە بۆنەی لـە چاپـدانی کتێبێـک، لـە لایـەن دەزگـای بـڵاوکـەرەوه بـە نووسـەر (یـان نوێنەرەکەی) دەدرێ. هەروەها: **حق ترجمه**

**حق تحقیق** ☜ **پژوهانه**

**حق تدریس:** ۱. مافی وانەبێژی؛ مافی دەرس گوتنەوه؛ بەرایی بۆ دەرس وتنـەوه ‹مـردان در مدرسەهای دخترانه حق تـدریس ندارنـد: پیـاوان لـە قوتابخانـەی کچانـەدا مـافی وانـەبێژیان نیـە› ۲. پارەیـەک کـە لـە بابـەت وانەبێژیـەوه بـە مامۆستا دەدرێ: **حقّالتدریس**

**حـق تعلیـف:** ئاڵـفانە؛ پووشـانە؛ پاوەنانـە؛

لەوەڕانە؛ سەریەل؛ پارەیەک کە ئاژەڵدار بۆ لەوەڕاندنی دەوڵەتەکەی بە خاوەن لەوەڕگەی دەدا.

**حق تقدّم** ☜ **حق اولویّت**

**حق تمبر:** پیتاکی تەمر؛ پارەیەک کە بە بۆنەی چەسپاندنی تەمر لە سەر بەڵگەی فەرمی، لە خاوەنەکەی دەسێنرێ.

**حق ثبت:** مافی نووسینی بەڵگە؛ مافی تۆمارکردن؛ پارەیەک کە بە بۆنەی نووسینی بڕیارنامەی سەودایەک لە دەفتەری فەرمی دەوڵەتیدا، لە کارێنەران دەسێنرێ.

**حق جوابگویی:** مافی وڵامدانەوە؛ مافی هەر کەس بۆ پەرسڤ دانەوە و بەرگری لە خۆی لە بەرانبەر تۆمەتێکەوە کە لە ڕۆژنامە یان گۆڤارێکدا لێی دراوە.

**حق چاپ:** مافی لە چاپدان؛ مافێ کە بۆ چاپ کردنی کتێبێک بە کەس یان دامەزراوەیەک دەدرێ.

**حق حاکمیت:** مافی میری؛ مافی حکوومەت کردن.

**حق حضانت:** مافی چاوەدێری؛ مافی بەخێوکردن؛ مافی ئاگاداری و چاوەدێری کردن لە منداڵ.

**حق زحمه:** مووچە؛ کارانە؛ پارەیەک کە بابەت ئەنجامدانی کارێک بە کەسێ دەدرێ: **حقّ‌ُالزحمه**

**حق سُکنی:** مافی نیشتەجێیی؛ مافی ئاکنجیەتی؛ مافێ کە بابەتی نیشتەجێ بوون لە جێگایەکدا بە کەسێک دەدرێ.

**حق سکوت:** مافی بێدەنگی؛ پارە یان شتێک کە بۆ نەدرکاندنی ڕازێک بە کەسێ دەدرێ: **حقّ‌ُالسکوت**

**حق شرب:** ئاوانە؛ مافی کەڵک وەرگرتنی کەس یان مڵکێک لە سەرچاوەیەکی ئاو (چەم، بیر، سەرچاوە).

**حق شُفعه:** مافی کەوتنەبەری هەر بەشدارێک لە کڕینی بەشی بەشدارێکی‌تر، بە مەرجێ کە وازی لە فرۆشتنی بێ.

**حق عبور:** مافی بواردن: ١. مافی بگاردن لە مڵکی کەسێکی‌تر ٢. پارەیەک کە بۆ تێپەڕینەوە لەو جێگایە وەردەگیردرێ ‹حق عبور از اتوبان: مافی بواردن لە شاڕێ›.

**حق کسب:** مافی کەسبوکار؛ پارەیەک کە کرێگر بە خاوەن مڵکی دەدا بۆ کەڵک وەرگرتن لەو جێیە بە مەبەستی جێگای کاسبی.

**حق مسکن:** مافی خانووبەرە؛ پارەیەک کە بەرپرسی مەزرینگە، بۆ ماڵ گرتن بە کارگێڕانی بێماڵی دەدا.

**حق مقام:** مافی پایە؛ بەشێک کە بە بۆنەی دارا بوونی پلە و پایەیێکی تایبەتەوە، بە خاوەنەکەی دەدرێ.

**حق وتو:** مافی ویتۆ؛ مافی نوێنەرێک بۆ دژایەتی لەگەڵ بڕیاری دیتران و هەڵوەشانەوەی بە تەنیا.

**حق ویزیت:** مافی ویزیت؛ پارەیەک کە بژیشک بۆ دیتنی نەخۆش وەریدەگرێ.

⊡ **حق به حقدار رسیدن:** حەق بە حەقدار گەیشتن؛ گەیشتنی شتێ بە کەسێ کە شیاوی بووە.

**حق به گردن کسی داشتن:** حەق بە سەر کەسێکەوە بوون؛ بە ئەنجامدانی خزمەتێکی شیاو کەسێ منەتباری خۆ کردن.

**حق کسی/ چیزی را ادا کردن/ به جا آوردن:** مافی کەسێ/شتێ بەجێ هێنان؛ کار یان ئەرکێکی شیاو بۆ شت (یان کەسێ) ئەنجام دان ‹حق برادری را ادا کرد: مافی برایەتی بەجێ هینا›.

**حق دادن:** حەق دان؛ ماف دان ‹به او حق می‌دهم که عصبانی باشد: حەقی پێ‌ئەدەم کە تووڕە

بیّ›.

**حق داشتن:** ۱. مافدار بوون؛ بەماف بوون؛ بە دەق بوون ‹شیرین هم در این خانه حق دارد: شیرینیش لەمماڵەدا مافی هەیە› ۲. حەقی خۆی بوون؛ حەقدار بوون؛ خاوەن ئاکار و قسەی ڕاست بوون ‹اگر اعتراض کرد حق دارد: ئەگەر بەرهەڵست وەستاوە حەقی خۆیە›.

**حق‌کسی بودن:** ۱. مافی کەسێ بوون ‹این پول حق آزاد است: ئەم پارەیە مافی ئازادە› ۲. حەقی خۆی بوون؛ بۆ کەسێ ڕەوا بوون ‹حقش بود بیرونش می‌کردی: حەقی خۆی بوو دەرت بکردایە›.

**حق‌کسی را خوردن/ پایمال کردن:** مافی کەسێ خواردن/ ژێر پا کردن؛ حەقوو یۆی واردەی؛ ئەوی کە هی کەسێکە گرتن و پێ‌نەدانەوە ‹حق خواهرشان را خوردند و آن نصفه سهمش را هم ندادند: مافی خۆشکەکەیان خوارد و ئەو نیوە بەشەشیان پێ نەدا›.

**حق کسی را کف دستش گذاشتن:** ۱. حەقی کەسێ نانە مشتیەوە؛ بە سووکایەتیەوە جیرەی کەسێ پێدان؛ قەرزی کەسێ دانەوە ۲. *[کنایی]* جزیا دانەوە؛ کاری ناڕەوای کەسێ تۆڵە کردنەوە.

**حق مطلب را ادا کردن:** بەجوانی ڕوون کردنەوەی مەبەستێک.

**در حق کسی کاری کردن:** بۆ کەسێک کارێکی باش کردن.

**حق** [2]: *صفت.* حەق؛ ڕاس؛ ڕاست و درووس؛ تەبا لەگەڵ ڕست و نەریتی پەسندکراودا ‹حرف حق: قسەی حەق›.

▣ **حق بودن:** حەق بوون؛ دروست بوون؛ ڕاست بوون؛ ڕاس بیەی؛ شیاو بوون ‹همه‌اش حق بود: هەمووی ڕاست بوو›.

**حق گفتن:** ڕاست گوتن/ کردن؛ حەق وتن؛ ڕاس واتەی؛ گوتنی قسەی ڕاست و دروست ‹آزاد حق می‌گفت، تو مرد عمل نیستی: ئازاد ڕاستی دەگوت، تۆ پیاوی کار نیت›.

**حق را ناحق کردن:** شیر بە قیرکردن؛ حەق ناحەق‌کردن؛ دادوەری نادرووس کردن؛ دژ بە ڕاستی و دروستی کار کردن ‹می‌خواهی پول بدهی تا حق را ناحق کنی؟!: ئەتەوێ پارە بدەی شیر بە قیر کەی؟!›.

**از حق نگذشتن:** لە حەق لانەدان؛ لە ڕاستی ڕوو نەچەرخاندن؛ لە ڕێی دروست نەترازان ‹از حق نگذریم خوب کار کرد: لە حەق لانەدەین باشی کار کرد›.

**حقا** / haqqā/: [عربی] *حرف.* بەڕاستی؛ بەڕاسی، حەقای حەق؛ وشەی پێداگری و پەسند کردن ‹حقّا که مرد بزرگی است: بەڕاستی پیاوێکی گەورەیە›.

**حقاً** / haqqan/: [عربی] *قید.* ۱. بەحەق ‹حقّاً این پول به او می‌رسد: بەحەق ئەم پارەیە بەو دەگا› ۲. بەڕاستی؛ بەڕاسی ‹حقّاً مرد بزرگی است: بەڕاستی پیاوێکی گەورەیە›.

**حقابه** / haqqābe/: [عربی/ فارسی] *اسم.* نۆرەئاو؛ نۆبەئاو؛ نۆگەئاو؛ بەشەئاو؛ سەرەئاو؛ مافی زەمینێک بۆ کەڵک وەرگرتن لە سەرچاوەیەکی گشتی (چەم، کانی،...).

**حقارت** / heqārat/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. چکۆلەیی؛ چکۆڵەیی؛ چکوولەیی؛ پچووکی؛ بچووکی؛ گچکەیی ‹حقارت جثه: بچووکی لەش› ۲. سووکی؛ بێ‌بایەخی؛ بێ‌ئەرزشی ‹احساس حقارت: هەستی سووکی›.

**حقارتبار** / heqāratbār/: [عربی/ فارسی] *صفت.* سووک؛ سووکانە؛ هووادارانە؛ هۆی پەیدا بوونی هەستی سووکی ‹با شوهرش رفتاری حقارتبار داشت: لەگەڵ شووەکەیدا ئاکارێکی سووکی هەبوو›.

**حق‌البوق** / haqqolbûq/: (!) [عربی/ معرب] *اسم. [تعریض]* بەرتیلانە؛ ئەوی کە بە شێوازی بەرتیل یان پیتاک دەدرێ یان وەرئەگیردرێ ‹دە هەزار

تومان هم منشی حق‌البوق گرفت: نقیسکاره‌کەش دەهەزار تمەن بەرتیلانەی وەرگرت›.

**حق‌التحقیق** / haqqottahqîq/: [عربی] ☜ **پژوهانه**

**حق‌التدریس** / haqqottadrîs/: [عربی] ☜ حق تدریس ، **حق**[1]

**حق‌الزحمه** / haqqozzahme/: [عربی] ☜ حق زحمه ، **حق**[1]

**حق‌السکوت** / haqqossukût, -sokût/: [عربی] ☜ حق سکوت ، **حق**[1]

**حق‌العمل** / haqqol'amal ، ـها/: [عربی]/اسم. کارمز؛ کارانە؛ پاداش یان مزی ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو.

**حق‌العمل‌کار** / haqqol'amalekār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. کارمزکار؛ کەسێ کە لە بەرانبەر گرتنی بەشێکی کەم لە پارەی سەوداوە، ئەبێتە هۆی سەرگرتنی مامڵە. هەروەها: **حق‌العمل‌کاری**

**حق‌القدم** / haqqolqadam/: [عربی]/اسم. هەنگاوانە؛ لاقۆرانە؛ قەدەمانە؛ کراپا؛ کالەدڕانە؛ پالادڕانە؛ پالامز؛ پامز؛ پارەیەک کە بۆ هاتنی کەسێک و ئەنجامدانی ڕاژەگەلێک پێی بدرێ (بەتایبەت بۆ بژیشک بە کار دەڕوا).

**حق‌الله** / haqqollāh/: [عربی]/اسم. [اسلام] مافی خوا؛ حەقۆڵلا؛ حەقی خودا؛ ئەرکی سەرشانی هەر کەسێک لە بەرانبەر خوداوە (وەکوو بەندایەتی).

**حق‌المرتع** / haqqolmarta'/: [عربی]/اسم. پووشانە؛ ئالفانە؛ پاوەنانە؛ سەڕیەل؛ شاخانە؛ لەوەڕانە؛ باجی لەوەڕ؛ پارەیەک کە خاوەن لەوەڕگە لە چێواری دەستێنێ.

**حق‌الناس** / haqqonnās/: [عربی]/اسم. [اسلام] مافی خەڵکی؛ حەقولناس؛ حەقی‌خەڵکی؛ ئەرکێ کە هەر کەس لە بەرانبەر کەسانی دیکەوە لە سەر شانیەتی.

**حق‌الوکاله** / haqqolvekāle ، ـها/: [عربی]/اسم. بریکارانە؛ پارەیەک کە بریکار بۆ ئەنجامدانی کار، لە بریکارگری خۆی دەستێنێ.

**حقانیت** / haqqānîyyat/: [عربی]/اسم. هەقانەت؛ ڕاستێتی؛ ڕاستی و ڕەوایی؛ ڕاس و پاکی؛ دروستی ئاکار یان خوازەیەک ‹این سندها دلیل حقانیت اوست: ئەم بەڵگانە هۆی هەقانەتی ئەوە›.

**حقایق** / haqāyeq/: [عربی] جمعِ ☜ **حقیقت**

**حق‌باور** / haqbāvar ، ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. بەبڕوا؛ بڕوادار: ١. بڕوامەند بە هەبوونی حەق ٢. هۆگر یان پشتگری ڕێگەی دروست. هەروەها: **حق‌باوری**

**حق‌به‌جانب** / haqbecāneb ، ـها/: [عربی/ فارسی/ عربی] صفت. نەرمەبڕ؛ سیسەمار؛ بە ڕواڵەتی دروست و دوور لە هەڵەکاری و ناڕێکی، زۆرتر بۆ خاپاندنی دیتران.

**حق‌پرست** / haqparast ، ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. ١. حەق‌پەرست؛ حەق‌خواز؛ خوازیاری ڕاستی و دروستی ٢. [کنایی] خوداپەرست؛ خواپەرست؛ خواپەرس.

**حقجو** / haqcû ، ـیان/: [عربی/ فارسی] صفت. حەق‌خواز؛ خوازیاری ڕاستی و دروستی ‹مردم حقجو: **خەڵکی** حەق‌خواز›.

**حقد** / heqd/: [عربی]/اسم. [ادبی] ١. ڕک؛ قین؛ قینی؛ ڕق؛ هەیف ٢. قین‌کێشی؛ ڕک‌هەڵگری؛ قینەونی؛ قین‌لەدڵی.

**حقدار** / haqdār/: [عربی/ فارسی] صفت. حەقدار؛ خاوەن حەق ‹حق به حقدار رسید: حەق گەیشتە حەقدار›.

**حق‌شناسی** / haqšenāsî/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئەمەگناسی؛ نمەک‌ناسی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی ئاگا بوون لە بایەخی چاکە و یارمەتی کەسانی دیکە لەمەڕ خۆوە ٢. /ـها/ سپاسگوزاری بە بۆنەی چاکەیەک کە لەگەڵی کردوویانە. هەروەها: **حق‌شناس**

**حق‌کشی** / haqkošî ، ـها/: [عربی/ فارسی]اسم. پێشێل‌کاری؛ حەق‌کوژی؛ کار یان ڕەوتی پێشێل کردنی مافی کەس یان کەسانێک.

**حقگـو** / haqgû ، ـیان/: [عربی/ فارسی] صفت. حەق‌بێژ؛ ڕاست‌بێژ؛ ڕاست‌واچ؛ حەق‌وێژ ‹حقگـو را نباید کشت: نابێ حەق‌بێژ بکوژرێت›.

**حـق‌نـشناس** / haqnašnās ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. نمەک‌نەناس؛ ئەمەگ‌نەناس؛ بێ‌ئەمەگ؛ ناسپاس؛ پێ‌نەزان.

**حـق‌نـشناسی** / haqnaš(e)nāsî ، ـها/: [عربی/ فارسی]اسم. ئەمەگ‌نەناسی؛ نمەک‌نەناسی؛ ناسپاسی؛ پێ‌نەزانی.

**حقنه** / hoqne/: [عربی]اسم. [نامتداول] ۱. عیماله؛ هوقنە؛ کاری تێرژاندنی دەرمانی تراو بۆ ناو ڕێخۆڵە ۲. [نامتداول] تراوی هوقنە؛ هەقنە؛ دەرمانی عیماله. هەروەها: **حقنه کردن**

**حق‌وحساب** / haqqohesāb ، ـها/: [عربی]اسم. [مجازی] بەرتیل ‹تا حق‌وحساب را نگرفت کارم را راه نینداخت: تا بەرتیلی نەگرت کارەکەمی جێبەجێ نەکرد›.

**حق‌وحقوق** / haqqohuqûq, -hoqûq/: [عربی] اسم. [گفتاری] مزوکرێ؛ کۆی مووچە و ماف ‹تا حق‌وحقوق مرا ندهید از اینجا نمی‌روم: تا مزوکرێکەم نەدەن لەیرە ناڕۆم›.

**حقـوق** / huqûq, hoqoq ، ـها/: [عربی]اسم. ۱. جمعِ ☜ **حق**[1] ۲. مووچە؛ مانگانە؛ مواجوو؛ پارەیەک کە مانگانە بە کرێکار یان مووچەخۆر دەدرێ ۳. قانوون‌ناسی؛ زانستی ناسین و لێکۆڵینەوەی قانوون.

▣ **حقـوق اجتمـاعی**: بەشداری کۆمەلایەتی؛ بەشداری جڤاتی؛ (پەیوەند بە کۆمەڵگاوە، وەکوو بەشداری هەڵبژێران، هەڵبژاردن و بەشداری دامەزراندن).

**حقـوق اداری**: بەشداری مەزرینگەیی/ کارگێری؛ بەشداری کارگێری؛ ئەو بەشە لە زانستی مافناسی کە لە دامەزراوەی کارگێری ولات و ئەرک و مافی لێپرساوان و بەڕێوەبەران دەتۆژێتەوە.

**حقوق از کار افتادگی**: بەشداری لەکارتەیی/ لەکار کەوتوویی؛ بەشداری لەکارتەیی؛ مووچەیەک کە بە هۆی لەکارکەوتوویی مووچەخۆر، پێی دەدرێ.

**حقوق اساسی**: بەشداری بنەمایی/ سەرەکی؛ بەشداری سەرەکی؛ ئەو بەشە لە زانستی مافناسی کە لە شێوەکاری حکوومەت و ئەرکەکانی دەکۆڵێتەوە.

**حقوق بازنشتگی/ تقاعد**: کارکەناری؛ بەشداری وەنیشتەیی؛ مووچەی هەڵپەسێراوی لە کار؛ مووچەیەک کە کارگێڕ یان کارکەر لە سەردەمی کارکەناریدا (زۆرتر مانگانە) وەریدەگرێ.

**حقـوق بـشر**: مافی مرۆڤ؛ بەشداری مرۆ؛ کۆمەڵەی ماف و سەربەستیەک کە بە کەسێک بەبێ ڕەچاوکردنی بیر و بروا، ڕەگەز، نەتەوە، ولات و... دەدرێت.

**حقوق بین‌الملل**: بەشداری نێونەتەوەیی؛ لقێ لە زانستی مافناسی کە قانوونی نێوان چەند ولات تا و توێ دەکا.

**حقوق تجارت**: بەشداری بازرگانی؛ لقێ لە زانستی مافناسی کە دەپەرژێتە سەر قانوونگەلی پێوەندیدار بە چالاکی ئابووریەوە.

**حقوق تطبیقی**: بەشداری بەراوردی؛ لقێ لە زانستی مافناسی کە باسی لە سەر لێکدانەوەی قانوون و بنکەگەلی قانوونی ولاتانی جۆراوجۆرە.

**حقوق جزا**: قانوونی سزا؛ ئەو بەشە لە زانستی مافناسی کە لە سەر قانوون و چۆنیەتی جزیادانی تاوانباران باس دەکا. هەروەها: **حقوق جنایی**

**حقوق حقّه**: بەشداری ڕەوا؛ مافی ڕاستەقینە و

جێ بڕوای قانوون یان عورف.
**حقوق سیاسی:** بەشداری ڕامیاری؛ مافێ کە بە هۆی ئەوەوە کەسێ دەتوانێ لە کرد و کاشی ڕامیاریدا بەشدار بێ.
**حقوق شخصی:** بەشداری تاکەکەسی؛ مافی تاکی؛ مافی کەسێک لە پەیوەندەی نێوان خۆی و کەسانی‌تردا: **حقوق فردی**
**حقوق طبیعی:** بەشداری سروشتی؛ مافی مرۆڤ بۆ بەشداری لە ژیان، خوازەگەلی سروشتی و هاوکاری لەگەڵ کەسانی‌تردا بۆ گەیشتن بە ژیانێکی خۆشتر.
**حقوق عرفی:** بەشداری ئاسایی/ گەلەمپەری؛ بەشداری گەلەمپەری: ١. مافێ کە بە پێی نەریتی کۆمەڵگاوە بە خەڵک دەدرێ ٢. بەشێ لە زانستی مافناسی کە باس لە قانوونگەلی عورفی دەکا.
**حقوق فردی** ☜ **حقوق شخصی**
**حقوق کار:** بەشداری کار؛ بەشێ لە زانستی قانوون‌ناسی کە لە قانوونی کار و پێوەندی نێوان کرێکار و خاوەن‌کار باس دەکا.
**حقوق گمرکی:** بەشداری پیتاکی؛ مافی گومرۆک؛ پارەیەک کە مەزرینگەی گومرۆک لە کاتی هەناردن و هاتنی کاڵادا لە خاوەنەکەی دەستێنێ.
**حقوق مدنی:** بەشداری شارستانیەت؛ بەشێک لە زانستی مافناسی کە لە قانوونگەلی سەبارەت بە مرۆڤ و بنەماڵە و سەودا دەتۆژێتەوە.
**حقوق وظیفه** ☜ **وظیفه‌ـ٥**
**حقوق‌بگیر** / huqûqbegîr, hoqûq- ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* مووچەخۆر؛ جیرەخۆر؛ جیرەهەر؛ کەسێ کە بە مەعاشێکی دیاریکراوەوە کار دەکا ‹پسرش حقوق‌بگیر است: کوڕەکەی مووچەخۆرە›.
**حقوقدان** / huqûqdān, hoqûq- ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* قانوون‌ناس؛ زاکوون‌زان؛ سەردەرچوو لە قانووندا.
**حقوقی**[1] / huqûqî, hoqûqî/: [عربی] *صفت.* قانوونی؛ پێوەندیدار یان سەر بە قانوون.
**حقوقی**[2]: *قید.* مووچەیی؛ جیرەیی؛ بە شێوەی گرتن یان دانی مووچە ‹اول حقوقی کار می‌کرد، اما حالا کارش کنتراتی است: لە هەوەڵەوە مووچەیی کاری دەکرد، بەڵام ئێستێ کارەکەی قونتەراتیە›.
**حقه** / haqqe/: [عربی] *صفت.* ڕاستەقینێ؛ ڕاستەقینە؛ ڕاستەقانی؛ بەحەق ‹حقوق حقه: مافی ڕاستەقینێ›.
**حقه**[1] / hoqqe ، ـها/: [عربی] *اسم.* ١. هۆقە؛ دەفری گچکەی گۆزەڵەئاسا ‹حقەی وافور: هۆقەی بافوور› ٢. فێڵ؛ گزی؛ گزە؛ گزیە؛ کەڵەک؛ دەسەداو؛ چاپ؛ دەلەسە؛ لمرە؛ لمر؛ مەکر؛ هەقە؛ هەنگ ‹دوباره چه حقه‌ای می‌خواهی بزنی؟: دیسان چ فێڵێکت لە ژێر سەرە؟› ٣. *[نامتداول]* تەڕدەستی.
▣ **حقه زدن:** گزەکردن؛ فێڵ‌کردن؛ کەڵەک لێدان.
**حقه**[2] /ـها/: *صفت. [گفتاری]* فێڵباز؛ کەڵەکباز؛ گزیکار ‹خیلی حقه است: زۆر فیلبازە›.
**حقه‌باز**[1] / hoqqebāz ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم. [قدیمی]* تەڕدەست.
**حقه‌باز**[2] / ـها/: *صفت.* فێڵباز؛ گزێکەر؛ گزیکار؛ فریوکار؛ کەڵەکباز؛ داولێدەر؛ گڕنی‌باز؛ دەغووڵ؛ فێلوو؛ دەغڵباز؛ هەنگباز؛ حەکەباز؛ ئاگوڵباز؛ حەکار؛ دەسبڕ؛ لمرواز؛ ئیادویار.
**حقه‌بازی** / hoqqebāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم. [گفتاری]* فێڵبازی؛ فریوکاری؛ گەڕنی؛ گەڕبازی؛ کەڵەکبازی؛ حۆقەبازی؛ لابانی؛ قەلودەل‌کاری؛ لمرەبازی ‹با حقه‌بازی مغازه را از دست آزاد درآورد: بە فێڵبازی دووکانەکەی لە دەس ئازاد دەرهێنا›.
**حقیر** / haqîr/: [عربی] *صفت. [ادبی]* بێ‌نرخ؛ بێ‌بایەخ؛ سووک و چرووک؛ هیچ و پووچ؛

هوودار ‹آدم حقیر؛ کار حقیر: مرۆی بێ‌نرخ؛ کاری بێ‌بایەخ›.

◘ **حقیر شمردن:** بە کەم گرتن؛ سۆک لێنەوین؛ قەدر نەزانین؛ بێ‌بایەخ کردن.

**حقیقت** / haqîqat، ـها؛ حقایق/: [عربی]/اسم. راستی؛ راسی: ۱. ئەوی لەگەڵ راستی و دروستیدا هاوڕێیە ‹حقیقت چیست؟ راستی چیە؟› ۲. حەق؛ بێ‌لار و خواری؛ بڕوا یان قسەی راست و دروست ‹حقیقت تلخ است: حەق ڕەقە› ۳. ئەو شتەی کە هەیە. بەرانبەر: **مَجاز** ٤. /ادبی/ دروستی؛ درووسی ‹حقیقت ماجرا را نمی‌دانم: راستی ڕووداوەکە نازانم›.

◘ **در حقیقت:** لە ڕاستیدا؛ بە ڕاستی ‹در حقیقت او بانی این کار است: لە ڕاستیدا ئەو بناخەدارێژی ئەم کارەیە›.

◘ **حقیقت داشتن:** ڕاست بوون؛ دروست بوون ‹عروسی دخترش حقیقت داشت: زەماوەندی کچەکەی ڕاست بوو›.

**حقیقت گفتن:** ڕاست گوتن؛ دروست وتن؛ ڕاس واتەی ‹حقیقت را آزاد بە من گفت: ئازاد ڕاستەکەی پێ‌گوتم›.

**حقیقتاً** / haqîqatan/: [عربی] قید. بەڕاستی؛ لە ڕاستیدا؛ لە ڕاستی ‹حقیقتاً دانشمند است: بە ڕاستی زانایە›.

**حقیقت‌بین** / haqîqatbîn/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕاستی‌بین؛ هەقیقەت‌بین؛ بە توانا یان هۆگری بینینی ڕاستی و دروستی ‹اگر چشم حقیقت‌بین داشتی، می‌فهمیدی: ئەگەر چاوی ڕاستی‌بینت ببوایە، تێدەگەیشتی›.

**حقیقت‌جو** / haqîqatcû/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕاستی‌خواز؛ ڕاستیواز؛ بە خووخدە و هۆگری ڕاستی.

**حقیقی** / haqîqî/: [عربی] صفت. ڕاستەقینە؛ ڕاستەقینێ؛ ڕاستەقانێ: ۱. هەقیقی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ڕاستی ‹دوستی حقیقی: دۆستایەتی ڕاستەقینە› ۲. بەرچاو؛ دیار؛ خاوەن بیچم و دەستە. بەرانبەر: **مَجازی**

**حک** / hak(k)/: [عربی]/اسم. کار و ڕەوتی کۆڵین؛ کەندۆخین؛ هەڵکەندنی وێنە یان نووسراوەیەک لە سەر شتێکی ڕەق (وەک: دار، بەرد، کانزا).

**حکاک** / hakkāk، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. ۱. کۆڵەر؛ کەنەکار؛ کەندۆخ؛ کەسێ کە لە سەر بەرد، کانزا و... بە هەڵکۆڵین، وێنەیەک دەردێنێ یان شتێک دەنووسێ ۲. مۆرهەڵکەن؛ مۆرکەن.

**حکاکی** / hakkākî، ـها/: [عربی]/اسم. کەنەکاری؛ کەندۆخی؛ کۆڵەری: ۱. کار و ڕەتی کەنایش؛ کەنایا؛ کەناین؛ کەنایە؛ ڕەوێشتن؛ تاشین و کۆڵین لە سەر کانزا و بەردەوە ۲. /ـها/ ئەو شتەی کە لە کەندن ساز دەبێ ۳. پیشەی کۆڵەر ٤. /ـها/ کارگای کەنەکاری.

**حکام** / hokkām/: [عربی] جمعِ ☜ **حاکم**

**حکایات** / hekāyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **حکایت**

**حکایت** / hekāyat، ـها؛ حکایات/: [عربی]/اسم. ۱. چیرۆک؛ داستان؛ ڕازە؛ ڕاس ‹حکایت شیر و موش: چیرۆکی شێر و مشک› ۲. چیرۆک/ ڕازبێژی؛ داستان‌بێژی.

◘ **حکایت کردن:** چیرۆک گوتنەوە؛ داستان گێڕانەوە؛ ڕاز کردن؛ ڕاس گێڕانەوە؛ ڕازێ گێڵنایوە؛ سەرگوروشتە یان ڕووداوێک گێڕانەوە.

**حکایت گفتن:** چیرۆک گوتن؛ ڕاز کردن؛ داستان گوتن؛ نەزیلە گوتن؛ ڕازە واتەی.

**حکم** / hakam، ـها/: [عربی]/اسم. بەرەوان؛ بەرەڤان؛ داوەر؛ دادوەر؛ ناوبژیوان؛ کەسێ کە لە نێوان دوو کەسدا داوەری دەکات.

◘ **حکم شدن:** بوونە بەرەوان؛ بوونە بەرەڤان؛ داوەر بوون ‹سیروان حکم ما شد: سیروان بووە بەرەوانی مە›.

**حکم قرار دادن:** کردنە دادوەر؛ بەرەوان دانان؛ بەرەڤان دانان ‹زن و شوهر مرا حکم قرار دادند: ژن و شوو منیان کردە داوەر›.

**حکم** / hekam/: [عربی] جمعِ ☜ **حکمت**

**حکـم** / hokm ، ـها؛ احکام/: [عربی]/اسم. ۱. دەستوور؛ ڕستی؛ فەرمان؛ ئەمر؛ فەروار؛ هوود ‹حکم اداری: دەستووری مەزرینگەیی› ۲. بڕیار؛ بڕیاری دەوڵەتی؛ بڕیارێ کە لە لایەن دادگە یان دەستەی دادوەریەوە دەردەچێ ‹حکم اعدام: بڕیاری کوشتن› ۳. *[ریاضی]* حوکم؛ ئەنجامێ کە لە گریمانەیەکدا بە دەس دێ.

◙ **حکـم اعـدام:** بڕیاری کوشتن؛ بڕیاری خنکاندن یان بە هەر شێوەیەکی‌تر، لە ناو بردنی کەسێک. هەروەها: **حکـم بازداشت؛ حکم توقیف**

◙ **حکـم رانـدن:** حکوومەت‌کردن؛ میرایەتی کردن ‹سالها بر هندوستان حکم راندند: چەنایچەن ساڵ بە سەر هێندووستاندا حکوومەتیان کرد›.

**حکـم کـردن:** فەرمان دان؛ فرمان دان؛ دەستوور دان ‹حکم کرد که او را دستگیر کنند: دەستووری دا قۆڵبەسی کەن›.

**حکم کسی/ چیزی را داشتن:** وەکوو کەسێ/ شتێ بوون/ وابوون ‹آدم کاردان حکم کیمیا را دارد: مرۆی لەکارزان وەکوو گەوهەر وایە›: **در حکم کسی/ چیزی بودن**

**در حکم کسی/ چیزی بـودن** ☜ **حکم کسی/ چیزی را داشتن**

**حکما** / hokamā/: [عربی] جمعِ ☜ **حکیم**

**حکمـاً** / hokman/: [عربی]قید. هەر؛ بەناچار؛ ناچار؛ حەتم؛ ئیلا و بیلا ‹گفت حکماً باید بیایی: وتی هەر ئەبێ بیت›.

**حکمـت** / hekmat ، ـها؛ حِکَم/: [عربی]/اسم. ۱. هۆزانی؛ ژیری ‹حکمت به لقمان آموختن غلط است: هۆزانی بە لوقمان فێر کردن هەڵەیە› ۲. فەلسەفە ‹حکمت عملی: فەلسەفەی کرداری› ۳. هۆ؛ سۆنگە؛ بۆنە ‹حکمت این کارش را نفهمیدم: هۆی ئەم کارەیم نەزانی›.

◙ **حکمت الهی:** فەلسەفەی خواناسی.

**حکمت اولی:** هەبوون‌ناسی.

**حکمت طبیعی:** نێوی کۆنی زانستی فیزیک و شیمی و زانستی سروشتی.

**حکمت عملی:** فەلسەفەی کرداری؛ بنەما و ئاگاداری سەبارەت بە کار و کردەوە و کەین و بەینی مرۆڤ پێکەوە (وەک ئاکار، بنەوانی و سیاسەت).

**حکمت نظری:** بنەما و ئاگاداریی پێوەندیدار بەوەی کە لایەنی کردارییان نیە (وەک فەلسەفە، خواناسی، زانستی سروشتی و بیرکاری).

◙ **حکمت داشتن:** ۱. ورد بوون؛ گونجاو بوون؛ ئامۆژگاری تێدا بوون؛ مۆچیار چنە بیەی؛ خاوەنی هۆ یان هۆکارێ هەبوون ‹هر حرف و کار او حکمتی دارد: هەموو قسە و کارێکی هۆکارێکی هەیە› ۲. بە ئاوەز بوون؛ ژیر بوون ‹کمی حکمت داشته باش!: هێندێک ورد بە!›.

**حکمت‌آموز** / hekmatāmûz/: [عربی/ فارسی] صفت. ئامۆژیار؛ ئامۆچیار؛ بەتایبەتمەندی یان توانایی ڕاهێنانی ڕوانگەی مژیوەرانەوە.

**حکمـت‌آمیز** / hekmatāmîz/: [عربی/ فارسی] صفت. ئامۆژیارانە؛ تێکەڵ بە ئەندێشەی مژیوەرانە.

**حکمران** / hokmrān ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. فەرمانڕەوا؛ فرمانڕەوا؛ میر؛ ئەمیر ‹حکمران سلیمانیه بود: فەرمانڕەوای سلێمانی بوو›.

**حکمرانـی** / hokmrānî/: [عربی/ فارسی]/اسم. فەرمانڕەوایی؛ فرمانڕەوایی؛ ئەمیری؛ میری ‹سالها حکمرانی کرد: زۆر ساڵان فەرمانڕەوایی کرد›.

**حکمروا** / hokmravā ، ـیان/: [عربی/ فارسی]/اسم. فەرمانڕەوا؛ فرمانڕەوا؛ میر؛ ئەمیر.

**حکمروایی** / hokmravāyî/: [عربی/ فارسی]/اسم.

فەرمانڕەوایی؛ فرمانڕەوایی؛ میری؛ ئەمیری.

**حکمفرما**[1] / hokmfarmā/: [عربی/ فارسی]/اسم. زاڵ؛ چیر؛ چۆنیەتی دەست بە سەر جێگا یان شتێکدا چوون ‹سکوت بر مجلس حکمفرما بود: بێدەنگی بە سەر کۆڕەکەدا زاڵ بوو›.

**حکمفرما**[2]: صفت. زاڵ؛ چیر؛ خاوەن چۆنیەتی یان کارتێکری بە سەر جێگا یان شتێکدا ‹سکوت حکمفرما بر مجلس را شکست: بێدەنگی زاڵ بە سەر کۆڕەکەیدا شکاند›.

**حکمفرمایی** / hokmfarmāyî/: [عربی/ فارسی] /اسم. زاڵی؛ زاڵیەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی زاڵ بوون.

**حکمیت** / hakamîyyat/: [عربی]/اسم. داوەری؛ دادوەری؛ کەیخودایی؛ قەیخایی ‹کار اختلاف به حکمیت کشید: کاری ناکۆکی کێشایە داوەری›.

**حکمین** / hakameyn/: [عربی]/اسم. داوەران؛ دادوەران؛ دوو داوەر ‹حکمین حق را به شاکی دادند: داوەران حەقیان بە سکالا بەرەکەدا›.

**حکومت** / hukûmat, hokûmat، ـها/: [عربی] /اسم. حوکمەت؛ حکوومەت: ۱. فەرمانڕەوایی ‹خانوادەی پهلوی از سال ۱۳۰۴ تا سال ۱۳۵۷ بر ایران حکومت کردند: بنەماڵەی پەهلەوی لە ساڵی ۱۹۲۵ تا ساڵی ۱۹۷۹ بە سەر ئێراندا حکوومەتیان کرد› ۲. دەزگایەکی دەوڵەتی کە بە سەر وڵات یان ناوچەیەکدا فەرمان دەدا ۳. سیستەمی ڕامیاری ‹حکومت جمهوری: حکوومەتی کۆماری›.

▣ **حکومت استبدادی**: حکوومەتی ملهوڕی/ لاساری؛ حکوومەتی تەپەسەری؛ حکوومەتی زۆرەملی؛ حکوومەتێک کە گوێ نەداتە بیر و ڕای خەڵک و نوێنەرەکانیان: **حکومت دیکتاتوری**

**حکومت جمهوری** ☜ **جمهوری**

**حکومت دیکتاتوری** ☜ **حکومت استبدادی**

**حکومت مردم**: حکوومەتی خەڵکی؛ شێوە حکوومەتی وڵاتانی پێشکەوتوو کە بڕیار لە سەر بیر و بۆچوونی خەڵکە.

**حکومت مشروطه** ☜ **مشروطه**

**حکومت مطلقه**: حکوومەتی سەرەڕۆیی؛ حکوومەتی لاساری؛ فەرمانڕەوایی خۆسەرانەی کەسێ یان دەستەیەکی چکۆلە لە دەسەلاتداران بە سەر خەڵکدا.

▣ **حکومت کردن**: حکوومەت کردن؛ فەرمانڕەوایی کردن. هەروەها: **حکومت داشتن**

**حکومتی** / hukûmatî, hokûmatî، ـها/: [عربی] صفت. حکوومەتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە حوکمەت ‹نظام حکومتی: سیستەمی حکوومەتی›.

**حکه** / hekke/: [عربی]/اسم. خارشت؛ خارش؛ گەزەنگ؛ خوروو؛ چۆنیەتی خوران و ئالۆش بوون؛ وریەی.

**حکیم** / hakîm، ـها؛ ـان؛ حُکَما/: [عربی]/اسم. [قدیمی] ۱. فیلسووف؛ فەیلەسۆف ۲. بژیشک؛ پزیشک؛ پزشک.

**حکیمانه**[1] / hakîmāne/: [عربی/ فارسی] صفت. هێژایانە؛ ژیرانە؛ مژیوەرانە؛ ئاوەزمەندانە؛ زانایانە ‹اندیشەهای حکیمانه: ئەندیشەگەلی هێژایانە›.

**حکیمانه**[2]: قید. زانایانە؛ هێژایانە؛ ژیرانە؛ مژیوەرانە؛ ئاوەزمەندانە؛ بە شێوازی زانایانە ‹او حکیمانه داوری کرد: هێژایانە دادوەری کرد›.

**حکیمباشی** / hakîmbāšî، ـها/: [عربی/ ترکی] اسم. ۱. [تعریض] حەکیم؛ بژیشکی بێ خوێندنی زانستگایی ۲. [قدیمی] بژیشک؛ پزشک.

▣ **حکیمباشی را دراز کردن**: [کنایی] حەق تایی لە دۆلاوی کردنەوە؛ بە کەر نەویران و بە کۆپان فێر بوون؛ کار و ئەرکی کەسێک خستنە سەر شانی کەسێکی‌تر، یان سزا دانی کەسێکی بێ‌تاوان و بەستەزمان بە جێی تاوانبارێک.

**حل** / hal(l)/: [عربی]/اسم. ۱. حەل؛ چارەسەر؛ چارە؛ کار و ڕەوتی دۆزینەوەی پەرسڤی گرفت یان پرسیارێک ‹حل کردن سوآل: حەل کردنی

پرسیار› ۲. پەرسف؛ وەرامی پرسیار یان لیچار؛ ڕەوتی هەڵـهاوردن ‹حل معما: هەڵهاوردنـی مەتەڵـۆک› ۳. کار یان ڕەوتی توانەوەی ماکێک لە تراوێکدا ‹شکر در آب حل می شود: شەکر لە ئاوەدا دەتوێتەوە›.

▣ **حل اختلاف:** چاری کێشە؛ کار یان ڕەوتی لە بەین بردن یا لە بەین چوونی ناکۆکی لە نێوان دوو لایەنی شەڕدا.

▣ **حل شدن:** ۱. توانـەوە؛ تاوانـەوە؛ تاویانـەوە؛ تاویـەیوە ۲. هەڵـهاتن؛ بـە دەس هـاتنی پەرسڤی لیچار و مەتەڵۆک.

**حل کردن:** ۱. حەل‌کردن؛ چارەسەر کـردن؛ چارەکردن ۲. حەلین؛ تواندنـەوە؛ تاواندنـەوە؛ تاونەی؛ ئەوەتاونەی ‹مقداری نمک در آب حل کنید: تۆزێک خوێ لە ئاودا بتاوێننەوە›.

**حلاج** / hallāc ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. کەڤـانژەن؛ چێکەنەکار؛ جیکەنەکار؛ هەلاج؛ حەلاج؛ کێـرنج؛ ڤەبـسکوڕ؛ کەسـێ کـە پـەموو وکولـکە شـی دەکاتەوە.

**حلاجی** / hallācî/: [عربی]/اسم. ۱. کەڤـانژەنی؛ چێکەنـەکاری؛ هـەلاجی؛ حـەلاجی؛ کێرنجـی؛ ڤەبسکوڕی؛ پیشە یان کاری کەڤانژەن ۲. ـها/ کەڤـانژەنی؛ هـەلاجی؛ حـەلاجی؛ کارگـەی هـەلاجی ۳. *[مجازی]* کولـک و مـووش؛ کـار و ڕەوتی شی‌کردنەوە و باش لێ تۆژینەوە.

**حلال** / halāl/: [عربی] صفت. *[دین]* حەڵاڵ؛ ڕەوا؛ درووس؛ دروست: *الف)* لە بواری خواردن ‹گوشت شتر حلال است: گۆشتی وشتر حەڵاڵە› *ب)* لە بواری کار و کردەوە ‹ازدواج با دختر عمو و دختر خاله حلال است: خواسـتنی ئـامۆزا و میمکـەزا حەڵاڵـە› ❋ بەرانبەر: **حرام**. هـەروەها: **حـلال بـودن؛ حـلال شدن؛ حلال کردن**

**حـلال** / hallāl ، ـها/: [عربـی] صفت. ۱. تـوێن؛ تاوێنەر؛ ئاوکەر ‹حلال چربی: تاوێنـەری چـەوری› ۲. هەڵهێنەر؛ هەڵێنەر؛ چارەسەرکەر؛ چارەکەر.

▣ **حلال مشکلات:** ۱. چارەکـاری گرفـت ‹صبر حلال مشکلات است: سـەبر چارەکـاری گرفتـە› ۲. *[کنایی]* پارە؛ دراو؛ پووڵ.

**حـلال‌بـائی** / halālbā'î/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **حلال‌بایی**

**حـلال‌بـایی** / halālbāyî/: [عربـی/ فارسـی]/اسم. گەردن ئازایی؛ کاری بەخشینی تاوانی کەسێ لە ئاست خۆوە: **حلال‌بائی**

**حـلال‌زاده** / halālzāde ، ـها/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. ۱. حـەڵاڵ‌زادە؛ هـەڵاڵ‌زادە. بەرانبـەر: **حرامـزاده** ‹بچـەی حـلال‌زاده بـە دایـی‌اش مـی‌رود: منداڵی حەڵاڵ‌زادە لـە خاڵـی دەکـا› ۲. *[مجازی]* دروستکار؛ درووسکار.

**حلال گوشت** / halālgûšt/: [عربی/ فارسی] صفت. گۆشـتحـەڵاڵ؛ خـاوەنی گۆشـتێ کـە شـەرع خواردنی بە ڕەوا زانیوە. بەرانبەر: **حـرام‌گوشـت** ‹حیوان حلال‌گوشت: حەیوانی گوشت‌حەڵاڵ›.

**حـل‌المـسائل** / hallolmasā'el/: [عربـی] ☜ **حل‌المسایل**

**حل‌المسایل** / hallolmasāyel ، ـها/: [عربی]/اسم. کتێبێ کە پەرسف یـان ڕێگـە چـارەی گـەلێک پرسیاری تێدا نووسراوە.

**حـلال‌واری** / halālvārî/: [عربـی/ فارسـی] قیـد. *[گفتاری]* حەڵاڵ و زەڵاڵ؛ بە حەڵاڵی ‹حلال‌واری صدهزار تومان هم برای خودت منظـور کـن: حـەڵاڵ و زەڵاڵ سەدهەزار تمەنیش قازانج بۆ خۆت دانە›.

**حلالـی** / halālî/: [عربـی]/اسـم. *[گفتـاری]* ۱. حەڵاڵـی؛ ڕەوایـی ۲. گـەردەن‌ئـازایی؛ گەردن‌ئازایی؛ لێ خۆش‌بوویی ‹بابت تهمتی که بـه آزاد زده بود، از او حلالی خواست: لەمەڕ ئەو بوختیانە بۆ ئازادی کردبوو ، گەردن‌ئازایی لێ خواست›.

**حلالی** / hallālî/: [عربی] ☜ **حلّالیّت**

**حلالیـت** / halālîyyat/: [عربـی]/اسم. حەڵاڵـی؛ ڕەوایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی حەڵاڵ بوون ‹در مورد حلالیت پیوند اعضا سؤال داشت: سەبارەت بـە ڕەوایـی

پێوەندی ئەندامە وە پرسیاری هەبوو›.

◘ **حلالیت خواستن/ طلبیدن:** گەردنئازایی خواستن؛ داوای گەردەنئازایی کردن؛ داوای لێبووردن کردن ‹آمده بود بابت حرفهای آن روزش حلالیت بخواهد: هاتبوو سەبارەت بە قسەکانی ئەو ڕۆژەی گەردنئازایی بخوازێ›.

**حلالیت** / hallālîyyat/: [عربی]/اسم. دۆخ یان چۆنیەتی تاوێنەر بوون: **حڵاڵی**

**حلاوت** / halāvat/: [عربی]/اسم. شیرنی؛ شیرینی؛ شیرانی؛ شیرناتی ‹حلاوت کلام: شیرینی وتار›.

◘ **حلاوت کلام:** شیرینی قسە؛ شیرنی وتار؛ جوانی، ڕێکوپێکی و دڵبزوێنی قسە.

**حلب** / halab ، ـها/: [عربی]/اسم. پووت؛ پۆت؛ تەنەکە؛ تەنکە؛ تنکە: ۱. دەفرێکی شەشپاڵوو زۆرتر لە جنسی حەڵەبی ‹حلب روغن: پووتی ڕۆن› ۲. ئەو ڕادە لە هەر شتێک کە لە پووتێکدا جێ دەبێتەوە ‹دو حلب روغن مصرف شد: دوو پووت ڕۆن بە کار برا›.

**حلبی** / halabî ، ـها/: [عربی]/اسم. تەنەکە؛ حەڵەبی؛ حەڵەوی؛ پەڕەیێکی ناسکی ئاسن کە بە توێژێکی قەڵا داپۆشراوە ‹قوطی حلبی: قوتووی حەلەبی›.

**حلبی آباد** / halabîābād ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. [مجازی] حەڵەبیئاوا؛ گەڕەکە خانووی لە تەنەکە و شتی بێنرخیتر (زۆرتر لە دەور و بەری شاراندا).

**حلبی ساز** / halabîsāz ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] اسم. تەنەکەساز؛ حەڵەبیساز؛ وەستای دروستکردنی کەلوپەلی تەنەکەیی (وەکوو پووت، بۆشکە، قوڵەکوورە و...) ساز دەکا.

**حلبی سازی** / halabîsāzî/: [عربی/ فارسی]/اسم. تەنەکەسازی: ۱. کار یان پیشەی تەنەکەساز ۲. /ـها/ کارگەی تەنەکەسازی.

**حلزون** / halazûn ، ـها/: [عربی]/اسم. شەیتانۆکە؛ چاوشەیتانە؛ هێلکەشەیتان؛ شەیتانەکڵە؛ ناخوونشەیتان؛ کەسپک؛ قەپۆشکە؛ قەپووشک؛ گیاندارێکی نێر- مای بچووکی نەرم و شل، بە دوو جووتە شاخەک کە چاوی لە سەر جووتێکیانە و قاپیلکەیەکی لە سەر کۆڵە، خۆی تێدا دەشارێتەوە.

**حلزونی** / halazûnî ، ـها/: [عربی] صفت. پێچپێچۆکە؛ قیت و بەپێچ؛ پێچەڵپێچ؛ وەک قاپی شەیتانۆکە.

**حلق** / halq/: [عربی]/اسم. گەروو؛ گەڵوو؛ گلوەزێ؛ گەوری؛ کشکشێ؛ قورگ؛ قوڕوو؛ قوڕی؛ ئەوک؛ بەشێ لە دەزگای گەوارشت کە لە نێوان دەم و سوورێنچکدایە.

**حلقات** / halaqāt/: [عربی] جمعِ ☜ **حلقه**

**حلق آویز** / halqāvîz/: [عربی/ فارسی] صفت. ئەڵقاوێز؛ دارەڵۆز؛ بەپەت هەڵاوەسراو؛ ئاوێزانکراو لە ملەوە (بە ئاڵاندنی گوریسێک لە مل و پێوە هەڵواستن بە مەبەستی خنکاندن) ‹خودش را از درخت حلق‌آویز کرده بود: خۆی لە دارەکەوە ئەڵقاوێز کردبوو›.

**حلقوم** / holqûm ، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] گەروو؛ گەڵوو؛ گلوەزێ؛ قورگ؛ قوڕوو؛ قوڕی؛ ئەوک؛ قورتاسە ‹از حلقوم او بیرون کشید: لە گەرووی هێنایەوە›.

◘ **از حلقوم کسی بیرون کشیدن:** [مجازی] لە گەرووی کەسێ هێنانەوە؛ بە کەسێ هەڵهاوردنەوە؛ لە قوڕگی کەسێ هاوردنەوە؛ لە کەسێ بە زۆر ساندنەوە ‹پولها را از حلقومش می‌کشم بیرون: پارەکە لە گەرووی دێنمەوە›.

**حلقوی** / haqavî/: [عربی] صفت. گەوی؛ خەلەکی؛ ئاڵقەیی؛ جەغزۆکە؛ خڕۆکە؛ گاخگۆڕ؛ خازئاسا؛ وێنەی جەغز و بازنە ‹کرم حلقوی: کرمی گەوی›.

**حلقه** / halqe ، ـها؛ حَلَقات/: [عربی]/اسم. ۱. ئاڵقە؛ گەو؛ خەلەک؛ بازنە؛ چەمەر؛ چەمبەر؛ هەڵەک؛

خاز؛ گاخ؛ کەمە؛ گوهارۆک؛ هەڤێرکی؛ ترێ؛ هەر شتێکی خڕ، گرۆڤەر یان بازنەیی ‹حلقەی زلف؛ حلقەی زنجیر: ئاڵقەی زوڵف؛ گەوی زنجیر› ۲. ئاڵقە؛ بازنە؛ گەزرک؛ خەلەک؛ ئەو شتانەی کە بۆ خەملاندن و ڕازانەوە بە قامک، لووت یان گوێیدا دەکەن ‹حلقەی طلا: ئاڵقەی زێڕ› ۳. ئاڵقە؛ گەوی؛ یەکانەی شتگەلی جەغزۆکە ‹چهار حلقه فیلم؛ دو حلقه لاستیک: چوار ئاڵقە فیلم؛ دوو ئاڵقە لاستیک› ٤. گەو؛ گەڕ؛ خول؛ گەزرک؛ خەلەک؛ چەرخە؛ سیستەمێک کە دوای خولدانێک بگەڕێتەوە سەر شوێنی سەرەتایی خۆی ۵. کۆڕ؛ دانیشتن؛ کۆز؛ ئەنجوومەن یان دانیشتنێکی پاڵ بە پاڵی یەک ‹حلقەی دوستان: کۆڕی دۆستان› ٦. *[زیست‌شناسی]* گەو؛ خەپکە؛ چەمەر؛ چەمبەر؛ گەزرک؛ خەلەک؛ هەر بەشێکی سەربەخۆی لەشی کرمئاسایان ۷. چەمەر؛ چەمەرە؛ دانە؛ دەنک؛ یەکانەی شماردنی مار ‹باغ‌وحش تهران چهار حلقه مار بوآ خریداری می‌کند: باخچەی گیانەوەرانی تاران چوار دانە ماری بووا دەکڕێ›.

▣ **حلقه‌ی زنجیر:** ئاڵقە/ گەزک/ گەو/ چەمەرەی زەنجیر؛ هەر کام لەو جەغزۆکانەی کە چوونەتە نێو یەکەوە و زنجیریان سازکردووە.

**حلقه‌ی گل:** دەستە/ ئاڵقە/ ملوێنە/ گەزرک/ گەوی گوڵ؛ چەپکە گوڵی گەوە کراو کە بۆ شاباش لە ملی کەسێکی دەکەن.

**حلقه‌ی نامزدی:** ئەنگوستیلەی دەزگیرانی؛ ئاڵقەی دەزگیرانداری؛ ئەنگوستیلەیەک زۆرتر لە کانزای بەنرخ کە کچ و کوڕ لە کاتی دەسنیشان کردندا لە قامکی یەکی دەکەن.

▣ **حلقه زدن:** چەمبەر دان؛ چەمەرە دان: ۱. کەمەگرتن؛ گەو بەستن؛ گەمارۆ دان؛ دەور دان؛ تەمووره دان؛ قۆنگەره بەستن؛ پەڕانپەڕی شتێ گرتن ‹عده‌ای دور پیرزن حلقه زده بودند: بڕێ لە دەور پیرەژنەکە چەمەرەیان دابوو› ۲. پەپکە/ پاپۆکە دان؛ پەپکە بەستن؛ قەف دان؛ چەمۆڵە دەی؛ بە شێوازی ئەڵقە دەرهاتن ‹ماری در آنجا حلقه زده بود: مارێک لەوێدا پەپکەی دابوو›.

**حلقه‌به‌گوش** / halqebegûš ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* گوێ‌لەمست؛ گوێ‌ڕایەڵ؛ گۆش‌بەراواز؛ فەرمانبەری وەکوو نۆکەری وا چما خاوەنەکەی ئاڵقەی لە گوێی کردووە ‹غلام حلقه‌به‌گوش: نۆکەری گوێ‌لەمەست›.

**حلم** / helm/: [عربی] *اسم. [ادبی]* پشوودرێژی؛ پشووداری؛ نەرم و نیانی؛ تەوتین؛ تەوات؛ نتمداری ‹با تو گویم که چیست غایت حلم/ هر که زهرت دهد، شکر بخشش: بە تۆ بێژم چیە مانای ئەوپەڕی پشوودرێژی/ کەسێ زەهری دە زارت کرد، ئەتۆ شەکری لە بەر دانێ›.

**حلمه** / holme/: [؟] *اسم. [کالبدشناسی]* پرزەی زمان؛ هەر کام لەو بەرزاییە وردیلانەی وەک پرزگ کە لە سەر زمانە.

**حلوا** / halvā ، ـها؛ حَلویات/: [عربی] *اسم.* هەڵوا؛ حەڵوا؛ هەلاو؛ هەروا؛ هەلبا؛ هێولا؛ ئاوار؛ ئاسیدە؛ حەریر؛ چێشتی ئارد و شەکر (یان ماکی شیرینی دیکە) و ڕۆن و گوڵاو و زەعفەران.

▣ **حلوای گل:** هەڵوای گوڵەزەردە؛ هەڵوایەک کە بە جێی ئارد، گوڵە زەردەی تێ‌دەکەن.

▣ **حلوا-حلوا کردن:** *[تعریض]* لە سەر سەر نان؛ لە بان سەر دانیان؛ گەلەک ڕێزلێنان و گرنگی پێدان.

**حلوا خیر/ خیرات کردن:** *[تعریض]* هەڵوا بەشەو کردن (بۆ وریاکردنەوە لە مەترسیەک دەگوترێ) ‹خیال می‌کنی زندان حلوا خیر می‌کنند؟!: پێت وایە لە بەندیخانەدا هەڵوا بەش دەکەنەوە؟!›.

**حلوای کسی را خوردن:** *[کنایی]* هەڵوای کەسێک خواردن؛ لە پرسەی کەسێکدا بەشداری کردن؛ پاش مردنی کەسێ مانەوە.

**حلوااردە** / halvā'arde/: [عربی/ فارسی]/اسم. تاعین؛ هەڵوائەردە؛ ئاردەقوم؛ هەڵوای کونجی و دۆشاو.

**حلواشکری** / halvāšekarî/: [عربی/ سنسکریت] /اسم. ئاردپێچ؛ ئاردەقوم؛ هەڵوای کونجی و شەکر.

**حلواماهی** / halvāmāhî، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. ماسیهەڵوا؛ ماسیەکی پانۆکەی ناسکی خۆشخۆراکی ئاوی گەرمە: **ماهی حلوا**

**حلوائی** / halvā'î/: [عربی] ☜ **حلوایی**

**حلوایی** / halvāyî، ـها/: [عربی]/اسم. هەڵوایی: ١. هەڵواچی؛ کەسێ کە پیشەی سازکردن (و فرۆشتن)ی هەڵوایە ٢. کارگای هەڵوا ساز کردن ٣. هەڵوافرۆشی؛ دووکانی هەڵوا فرۆشی * **حلوائی**

**حل وفصل** / hall-o-fasl/: [عربی]/اسم. چاروبڕ؛ کار و ڕەوتی کۆتایی هێنان بە شەڕ و ناکۆکی ‹آخر توانستی اختلافشان را حلوفصل کنی؟: ئاخری توانیت ناکۆکیەکانیان چاروبر کەی؟›.

**حلول** / hulûl, holûl/: [عربی]/اسم. کاری دەرهاتن لە جێگا یان شوێنێکەوە.

▣ **حلول سال نو**: دەسپێکردنی ساڵی نوێ؛ داهاتنی ساڵی تازە ‹حلول سال نو را بە جنابعالی تبریک می‌گویم: دەسپیکردنی ساڵی نویتان لێ پیرۆزبایی دەکەم›.

▣ **حلول کردن روح کسی**: گیان خزانە لەشی کەسێکەوە؛ خزانی ڕۆحی کەسێ لە لەشی کەسێکیترەوە ‹شاید روح گرگ در او حلول کردە: گاهەز گیانی گورگ خزابیتە لەشیەوە›.

**حلویات** / halavîyyāt, halvîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **حلوا**

**حله** / holle/: [عربی]/اسم./ادبی/ ١. جلوبەرگی نوێ؛ بەرگی نوێ؛ گنجی گەوز ٢. جلوبەرگی خەملاو و ڕازاوە.

**حلیم**[١] / halîm/ ☜ **هلیم**

**حلیم**[٢]: [عربی] صفت. /ادبی/ پشوودرێژ؛ نەرم و نیان؛ بەپشوو؛ پشوودار؛ بردبار؛ دڵفراوان ‹مرد حلیم و موقری بود: پیاوێکی پشوودرێژ و سەنگین بوو›.

**حلیه** / helye/: [عربی]/اسم./ادبی/ خشڵ؛ زیوەر.

**حمار** / hemār، ـان/: [عربی]/اسم./ادبی/ کەر؛ هەر؛ گوێدرێژ ‹آدمی را عقل باید در بدن/ ورنه جان در کالبد دارد حمار: بۆ مرۆ ئاوەز لە لەشدا پێویستە/ باسی گیان بێ، خۆ کەریش گیانی هەیە›.

**حماسه** / hamāse, hemāse، ـها/: [عربی]/اسم. ١. /نامتداول/ پاڵەوانی؛ بەدڵ و جەرگی؛ ئازایەتی؛ دلێری ٢. شیعر یان چیرۆکێک کە لە بارەی دلێری و پاڵەوانەتیەوە گوتراوە ٣. بەسەرهاتی دلێران و پاڵەوانان ٤. /مجازی/ کار یان ڕووداوی قارەمانانە.

**حماقت** / hemāqat، ـها/: [عربی]/اسم. گەوجی؛ دەبەنگی؛ بێئاوەزی؛ سایلۆحی؛ گێژی؛ گێلی؛ بێفکری ‹خود بزرگ‌بینی نشان حماقت است: خۆ بە زل زانی نیشانەی گەوجیە›.

▣ **حماقت کردن**: گەوجیکردن؛ دەبەنگی کردن؛ کەریەتیکردن؛ گەوجی دانە خەرجا ‹حماقت کردی آن کار را نپذیرفتی: گەوجیت کرد ئەو کارەت قبووڵ نەکرد›.

**حمال** / hammāl/: [عربی]/اسم. ١. /ـها؛ ـان/ کۆڵبەر؛ کۆڵکێش؛ کۆڵهەڵگر؛ کوولی؛ هەمل؛ عەنباڵ؛ حەماڵ؛ حەنباڵ؛ حەمباڵ؛ عەمباڵ؛ عەمبار ٢. ☜ **کِشتیدُم-٢**

**حمالی** / hammālî، ـها/: [عربی]/اسم. کۆڵکێشی؛ حەماڵی؛ حەمباڵی: ١. کۆڵبەری؛ کۆڵهەڵگری ‹حالا دیگر حمالی هم ماشینی شدە است: ئێستە ئیتر کۆڵکێشیش بۆتە ماشینی› ٢. /کنایی/ کاری سەخت و کەم بارەچە.

**حمام** / hammām/: [عربی]/اسم. ١. /ـها/ گەرماو؛ گەرماوە؛ سناو؛ خانوویەک بە کەرەسەی پێویستەوە بەشێوەی ژووری جیاجیا و ئاوی

سارد و گەرم، کە هەر کەسێ دەتوانێ بە دانی پارەیەک بڕوا و خۆی تێدا بشۆرێ ‹حمام عمومی: گەرماوی گشتی› ۲. /ـها/ حەمام؛ حومام؛ حمام؛ سناو؛ ژوورێکی ساز کراو لە ماڵدا بۆ خۆ شوتن ‹توی حمام بودم کە تلفن زنگ زد: لە حەمام بووم تەلەیفوونەکە زەنگی دا› ۳. حەمام؛ کار یان ڕەوتی لەش خستنە بەر کارتێکری شتێکەوە بە مەبەستی دەرمان یان حەسانەوە ‹حمام آفتاب: حەمامی هەتاو› ٤. /ـها/ تەشت؛ دەفرێ کە تراوێکی تێدایە بۆ خووساندنی شتێک لە نێویدا ‹حمام آبکاری: تەشتی ئاوکاری›.

▣ **حمام خزینه:** خەزێنە؛ گەرماوی وا کە خەزێنەی ببێ.

**حمام خصوصی:** نمرە؛ حەمامی تایبەتی؛ حەمامی تاکەکەسی؛ گەرماوێ کە ژووری تایبەتی بۆ شوشتنی کەسێک (و هاوڕێکانی) هەبێ: **حمام نمره**

**حمام دوش:** حەمامی دووش؛ گەرماوێ کە بۆ شۆردن لە دووش کەڵک وەردەگیرێ.

**حمام زنانه:** حەمامی ژنانە: ۱. گەرماوی گشتی بۆ ژنان. هەروەها: **حمام مردانه** ۲. *[کنایی]* کانی ژنان؛ هانەو ژەنا؛ جێگای زۆر پڕدەنگ و قەرەباڵغ.

**حمام سونا:** حەمامی سۆنا: ۱. حەمامی وا کە بە هەڵم گەرم دەبێ ۲. حەمامی خاوەن کەرەسەی بەدیهێنانی هەڵم.

**حمام عمومی:** حەمامی گشتی؛ گەرماوی گشتی؛ گەرماوێ کە خەڵکی پێکەوە و پاڵ بە پاڵی یەک خۆیان دەشۆن.

**حمام نمره** ☜ **حمام‌خصوصی**

▣ **حمام آفتاب گرفتن:** خۆ هەڵخستن؛ خۆ بەر بەرۆچکە دان؛ بە ڕووتی لە بەر هەتاو هەڵاژیان.

**حمام خون به راه انداختن:** *[کنایی]* جۆگەی خوێن بەردانەوە؛ لافاوی خوێن خستنە ڕێ؛ قەڵاچۆ تێخستن؛ کوشت و کوشتاری زۆر کردن ‹نازیها در ورشو حمام خون بە راه انداختند: نازیەکان لە ڤەرشۆدا جۆگەی خوێنیان بەرداوە›.

**حمام رفتن/ کردن:** حەمام‌کردن؛ ڕۆیشتن بۆ گەرماو؛ بۆ خۆ شۆردن چوون بۆ حەمام.

**حمامه** / hammāme/: [عربی] ☜ **کبوتر-۱**

**حمامی** / hammāmî، ـها/: [عربی]/اسم. حەمامچی؛ حەمامدار؛ بەرپرسی حەمام ‹همسایەمان حمامی است: دراوسێکەمان حەمامچیە›.

**حمایت** / hemāyat، ـها/: [عربی]/اسم. پشتیوانی؛ پشتەڤانی؛ زێرەڤانی؛ پشتگری: ۱. ئاگاداری لە کەسێ یان شتێک لە بەرانبەر مەترسی یان گەزنەوە ‹حمایت از خانوادەهای بی‌سرپرست: پشتگری لە بنەماڵەگەلی بێ‌سەرپەرشت› ۲. پشتیوانی لە کەسێک بۆ ئەنجامدانی کارێک ‹حمایت از دولت: پشتیوانی لە دەوڵەت›.

**حمایتی** / hemāyatî/: [عربی] *صفت.* پشتگرانە؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی پشتیوانی‌کردن.

**حمایل** / hamāyel، ـها/: [عربی]/اسم. حەمایەل؛ حەمایل؛ حەنبەڵ؛ هەر چی ڕاست و چەپ دە مل کرێ و شۆڕ بێتەوە.

▣ **حمایل کردن:** خستنە سەر شان؛ کردنە شاندا؛ حەنبەڵ کردن؛ لە سەر شان شۆڕکردنەوە ‹دستش را حمایل گردنش کردە بود: دەستی خستبووە سەر شانی›.

**حمد** / hamd/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ستایش؛ پەسن؛ حەمد.

**حمد و سوره** / hamd-o-sûre/: [عربی]/اسم. حەمد و سوورە؛ دوو سوورەی حەمد و تەوحید کە لە نوێژا دەخوێنرێ.

**حمق** / homq/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* گەوجی؛ بێ‌ئاوەزی؛ دەبەنگی ‹خودستایی نشانەی حمق است: بە خۆدا هەڵگوتن نیشانەی گەوجیە›.

**حمقا** / homaqā/: [عربی] جمعِ ☜ **احمق**

**حمل** / hamal/: [عربی] /اسم. ۱. ☜ **برّە-۱**

٢. [قدیمی] خاكەلێوە؛ ئاخەلێوە؛ گوڵوەس؛ سیاوكام؛ گولوس؛ هەوەڵین بورج لە ١٢ بورجی ساڵ.

**حمل** / haml/: [عربی]/اسم. ١. ئاز و گۆز؛ كار یان ڕەوتی بردن؛ گواستنەوە؛ ڕاگوێزان؛ بەردەی؛ هەڵگرتن و بردنی شتێ لە جێگایەكەوە بۆ جێگایەكی‌تر ‹حمل بار؛ حمل مسافر: ڕاگوێزانی بار؛ گواستنەوەی مسافر› ٢. [نامتداول] بار؛ تۆڵ؛ پز؛ گۆدەك؛ منداڵێ كە لە سكی دایكدا بێ ٣. [ادبی] كار یان ڕەوتی وا دانان؛ بۆ چوون؛ گاهەزی دان ‹حمل بر خودستایی نشود: وای دامەنین بەخۆمدا هەڵدەڵێم›.

◙ **حمل اسلحه:** هەڵگرتنی چەك ‹دو نفر به جرم حمل اسلحه دستگیر شدند: دوو كەس بە تاوانی هەڵگرتنی چەك قۆڵبەست كران›.

**حمل بار:** بارەڵگری؛ هەڵگرتنی بار؛ هەڵگرتن و جێبەجێ كردنی بار ‹ماشین ویژەی حمل بار: ماشینی تایبەتی هەڵگرتنی بار›.

◙ **حمل شدن:** باركران؛ بران؛ بریەی؛ ئازوگۆزكران؛ هلهاتن؛ جێبەجێ بوونی بار لە جێگایەكەوە بۆ جێگایەكی دیكە ‹اثاث خانه به بانه حمل شد: كەلپەلی خانووەكە باركرا بۆ بانە›.

هەروەها: **حمل كردن**

**حملات** / hamalāt/: [عربی] جمعِ ☜ **حَمله**

**حمل‌ونقل** / haml-o-naql ، ـها/: [عربی]/اسم. ئازوگۆز؛ ئاڵوگۆڕ؛ ئاڵوگوێر.

**حمله** / hamle ، ـها؛ حَمَلات/: [عربی]/اسم. هەڵمەت؛ هێرش؛ هەو؛ گالا؛ شالاو؛ شاتاڵ؛ ڕاهشت؛ هێشك؛ پەلامار؛ هورووژم؛ ئرشت؛ هرشت؛ وەرد: ١. جووڵانی بە گوژم و گڕی شەڕهەڵایسێن بە مەبەستی گەزن‌گەیاندن یان تاراندنی دیتران ‹سگ به من حمله كرد: سەگەكە پەلاماری دام› ٢. ڕۆیین بەرەو لای دوژمن بۆ شكست پێدانی ‹دیشب به سنگرهای ما حمله كردند: دوێنێ‌شەو هێرشیان كردە سەر مەتەرێزەكانمان› ٣. جووڵانی بەلەز بەرەو ئامانجێك ‹همه یكباره به طرف شیرینی‌ها حمله كردند: گشت بە جارێ هێرشیان بردە سەر شیرنیەكان› ٤. [ورزش] بزووتن بەرەو زەوینی هەڤبەر یان پەڵ‌وپۆ بۆ وەرگرتنی سەرپشكیەك و بۆڕ پێدانی ‹تیم حریف دو بار به دروازەی ما حمله كرد: دەستەی هەڤبەر دوو جار هەڵمەتی دەروازەیان داین› ٥. پلار؛ ولەول و تووڕەیی وێڕای هەڵشاخان ‹روزنامەها به وزیر راه حمله كردند: ڕۆژنامەكان وەزیری ڕێیان دایە بەر پلار› ٦. گورمته؛ گورمژ؛ بەركردەوەی بە گزوگوژمی نەخۆشیەك ‹حملەی قلبی: گورمتەی دڵ›.

**حمله‌دار** / hamledār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. سەركاروان؛ سەرپەرشتی كاروانی حەج.

**حمله‌ور** / hamlevar/: [عربی/ فارسی] صفت. هەڵمەتبەر؛ شالاوبەر؛ پەلاماردەر؛ ورووژمكەر؛ هاژۆتكار؛ گورمژبەر؛ وەشكی.

**حمیت** / hamîyyat/: [عربی]/اسم. [ادبی] خیرەت؛ زۆم؛ هەستی پێویستی پشتیوانی كردن لە شتێكی خۆشەویست.

**حمیده** / hamîde/: [عربی] صفت. [ادبی] پەسندكراو؛ لەبار؛ شیاو ‹صفات حمیده: خۆ و خدەی پەسندكراو›.

**حمیر** / hemyar/: [عربی]/اسم. حێمیەر: ١. تیرەیەكی سپی پێستی سامی، نیشتەجێی یەمەن كە دوایی لەگەڵ تیرەكانی دیكەدا تێكەڵ بوون ٢. /ـها؛ ـان/ هەر كام لە كەسانی ئەو تیرەیە.

**حنا** / hanā/: [عربی]/اسم. خەنە؛ خەنێ؛ خنیە؛ هەنە؛ هنە: ١. /ـها/ بنچكێكی گوڵ سپی و هۆشەیی بە كۆمەڵە ٢. گەردی وشكەوبوو لە گەڵاگەڵی ئەو گیایە كە وەك ماكێكی ڕەنگی و ئاڕایشتی بە كاری دەبەن.

◙ **حنا بستن/ گذاشتن:** خەنەگرتن؛ گرتنەوەی خەنە بە سەر و دەست و پا و نینۆكاندا.

**حنای كسی (پیش دیگری/ دیگران) رنگ**

**نداشتن:** *[مجازی]* دەفە/ پارەی کەسێک لای کەسێک یا کەسانێکەوە دەنگ نەدان/ نەچوون؛ هاردی پەی یۆی نەمەنەی؛ بێبایەخ بوونی کەسێک بەلای کەس یان کەسانێکی ترەوە ‹حنای تو دیگر پیش ما رنگ ندارد: دەفەی تۆ چیتر لای ئێمەوە دەنگ نادا›.

**حنائی** / hanā'î/: [عربی] ☜ **حنایی**

**حنابندان** / hanābandān/: [عربی/ فارسی]/اسم. خەنەبەندان؛ خەنەبەنان؛ کۆ بوونەوەی ژنان شەوی پێش بووک بردن کە خەنە دەگرنە دەستی بووک و کیژان.

**حنایی**[1] / hanāyî/: [عربی]/اسم. خەنەیی؛ ڕەنگی سووری ڕۆشن کە لە قاوەیی دەکا: **حنائی**. هەروەها: **حنایی‌رنگ**

**حنایی**[2]: *صفت.* خەنەیی؛ خەنەین: ۱. خەناوی؛ تێکەڵ بە خەنە ‹دستم حنایی شد: دەسم خەناوی بوو› ۲. بە ڕەنگی خەنە ‹چند پر حنایی داشت: چەند پەڕی خەنەیی هەبوو› ❋ **حنائی**

**حنبلی** / hambalî, hanbalî/: [عربی]/اسم. حەمبەلی؛ حەنبەلی: ۱. یەک لە چوار مەزهەبی موسوڵمانانی سوننی کە ئیمام ئەحمەدی حەنبەل (۱٦٤-۲٤۱ ک. م.) و شاگرد و یارەکانی دایانناوە ۲. ـها/ شوێنکەوتووی ئیمام ئەحمەدی حەمبەل.

**حنجره** / hancare/: [عربی]/اسم. کشکشێ؛ بەشی بەدیهێنەری دەنگ لە نێوان زمان و گەروودا کە لە دوو ماسوولکەی ناسک و چینێک ژێتار پێک هاتووە.

**حنظل** / hanzal/: [عربی]/اسم. هندوانەی ابوجهل ☜ **هندوانه**

**حنفی** / hanafî/: [عربی]/اسم. حەنەفی: ۱. یەک لە چوار مەزهەبی موسوڵمانانی سوننی کە ئیمام ئەبووحەنیفە (۸۰-۱۵۰ک. م.) و شاگردەکانی دایانناوە ۲. ـها؛ ـان/ شوێن کەوتووی ئیمام ئەبووحەنیفەیە.

**حنوط** / hanût, honût/: [عربی]/اسم. حەنووت؛ حونووت؛ ماکێکی بۆنخۆشە لە لەشی مردووی دەدەن.

**حوا** / havvā/: [عربی]/اسم. ۱. حەووا؛ دایکەوا؛ ژنی بابەدەم؛ خێزانی بابەدەم؛ مەشیانە؛ هەوەڵین ژنی ئافرێنراو لە ئامۆژەکانی دینی موسوڵمانان، خاچپەرستان و جوولەکاندا ۲. *[نجوم]* ☜ **مارافسای ـ۲**

**حوائج** / havā'ec/: [عربی] ☜ **حوایج**

**حوادث** / havādes/: [عربی] جمعِ ☜ **حادثه**

**حواری** / havārî، ـان؛ ـون/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* حەواری؛ نازناوی هەرکام لە یارانی عیسای پێغەمبەر ‹یهودا یکی از دوازده حواری مسیح بود: یەهوودا یەک لە دوازدە حەواری مەسیح بوو›.

**حواس** / havās(s)/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **حِس** ۲. هزر؛ های؛ جەی؛ واق؛ سەرنج و ئامادەیی زەین ‹حواس کسی را پرت کردن: هزری کەسێ شێواندن›.

⊡ **حواس کسی به چیزی بودن:** هۆشی کەسێ بە لای شتێکەوە بوون؛ جەی یۆی لاو چێوێوەنە بیەی ‹حواسم به رادیو بود: هۆشم بە لای ڕادیۆکەوە بوو›.

**حواس کسی را پرت کردن:** هزری کەسێک شێواندن ‹صدای آژیر حواسم را پرت کرد: دەنگی ئاژیرەکە هزری شێواندم›. هەروەها: **حواس کسی پرت بودن؛ حواس کسی پرت شدن**

**حواس کسی نبودن:** *[گفتاری]* هۆشی کەسێک بە خۆیەوە نەبوون؛ بیری کەسێ بڵاو بوون؛ جەی نەبیەی؛ سەرنج نەدان ‹اصلاً حواسش نیست دارد چه می‌کند: هەر هۆشی بە خۆیەوە نیە چی ئەکا›.

**حواس‌پرت** / havāspart، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* کەم‌هۆش؛ کەم‌زەین؛ تووشی بیربڵاوی هاتوو ‹آدم حواس‌پرت که نباید سر صندوق بنشیند: مرۆی کەم‌هۆش کوا دەبێ لە سەر دەخڵەوە

دانیشێ›.

**حواس‌پرتی** / havāspartî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم/. کەمهۆشی؛ بیر بلاوی؛ کەمزەینی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی توانایی کەڵک وەرگرتن لە زەین و بیر و یاد.

**حواشی** / havāšî/: [عربی] جمعِ ☜ **حاشیه**

**حواصیل** / havāsîl ، ـها/: [عربی]/اسم/. ماسی‌خۆرە؛ شاوە؛ شاهۆ؛ شاڤ؛ ناوی چەن جۆر باڵندەیە کە لە قەراخی ئاودا دەژین.

▣ **حواصیل ارغوانی**: سوورەیلک؛ شاوە مل‌درێژ؛ جۆرێک ماسی‌خۆرەی شاپەڕ قاوەیی و سوورە کە لای چاوی بە چەند پەڕ ڕازاوەتەوە.

**حواصیل دودی**: شاوە بۆرە؛ شاوە سڵتانی؛ شاوە بەڵەک؛ جۆرێ ماسی‌خۆرەی گەورەی سەر سپی و بەرسینگ ڕەشە.

**حواصیل زرد**: شاوە جغەدار؛ شاوە زەردە؛ شاوە زەردکە؛ ماسی‌خۆرەیەکی زەرد و سپیە.

**حواصیل شب**: ڕەشە شاوە؛ واقی شەوێ؛ ماسی‌خۆرەی سەر و پشت ڕەشی باڵ و جووچک بۆر.

**حوالت** / havālat/: [عربی]/اسم/. [ادبی] هەواڵە؛ حەواڵە.

**حوالجات** / havālecāt/: (!) [عربی] جمعِ ☜ **حواله**

**حواله** / havāle ، ـها؛ حوالجات/: [عربی]/اسم/. حەواڵە؛ ئاراسە؛ پسوولە: ١. نووسراوەیەک کە تێیدا خوازراوە پارە یان شتێک بە هەڵگری بدرێ ‹این حواله را ببر ۵۰ بند کاغذ بگیر: ئەم حەواڵە بەرە و ۵۰ بەند کاغەز وەرگرە› ٢. ڕەوتی ناردن؛ پارە یان ماڵێک کە لە لایەن کەسێک یان دامەزراوەیێکەوە بۆ دیتری دەنێردرێت ‹صد تومان برایش حواله کردم: سەد تمەنم بۆ نارد› ٣. ڕەوتی خستن؛ ئەسپاردنی کارێک بە کەسێ، کاتێ یان شوێنێکی‌تر ‹به ماه آینده حواله کردند: خستیانە مانگێکی‌تر›.

▣ **حواله دادن کسی به جایی**: [کنایی] حەواڵە بە گەواڵە پێ کردنی کەسێک؛ کەسێک دەستاودەس پێکردن ‹مرد بیچاره را توی اداره از این اتاق به آن اتاق حواله دادند: ئەو پیاوە داماوەیان لە مەزرینگەدا، لەم دیو بۆ ئەو دیو حەواڵە بە گەواڵە پێ‌دەکرد›.

**حواله کردن چیزی به طرف کسی**: فڕێدانی شتێ بۆ کەسێک ‹سنگ را به طرفم حواله کرد: بەردەکەی فڕێدا بوم›.

**حوالی** / havālî/: [از عربی]/اسم/. دەوروبەر؛ دەور و وەر؛ هەڤێرکە؛ ئالی؛ دەوران‌پشت؛ دەوروپشت؛ مەوق ‹خانه‌شان در آن حوالی بود: ماڵەکەیان لەو دەوروبەرەدا بوو›.

**حوایج** / havāyec/: [عربی] جمعِ ☜ **حاجت: حوائج**

**حوت** / hût/: [عربی]/اسم/. ١. ☜ **ماهی[1]ــ١** ٢. [تقویم] ڕەشەمە؛ دوایین بورج لە دوازدە بورجی ساڵ.

**حورانی** / hûrānî/:/اسم/. حوورانی: ١. هۆزی کەوناری سپی‌پێستی نیشتەجێی ئاسیای بچووک ٢. ـها؛ ـان/ هەرکام لە خەڵکی ئەو هۆزە ٣. زمانی ئەو هۆزە.

**حوری** / hûrî/: [عربی]/اسم/. ـها؛ ـان/ حۆری؛ هووری؛ کیژی جوانی ناو بەهەشت.

**حوزه** / howze, ho:ze ، ـها/: [عربی]/اسم/. ١. ناوچە؛ دەوەر؛ دەڤەر؛ کاڤار؛ شوێن یان مەڵبەندێک کە لە ژێر کارتێکەری ڕووداوێکی سروشتی، کار یان ئاکارێکدا بێ ‹حوزه‌ی انتخابات؛ حوزه‌ی نفتی: ناوچەی هەڵبژاردن؛ دەوەری نەوتی› ٢. بنکە؛ جێگە یان ناوەندی پێوەندیدار بە کارێکەوە ‹حوزه‌ی حزبی: بنکەی حیزبی›.

▣ **حوزه‌ی استحفاظی**: دەڤەری پاسەوانی؛ ناوچەی چاوەدێری.

**حوزه‌ی انتخاباتی**: ناوچەی هەڵبژاردن؛ ناوچەیەک لە شار یان پارێزگایەک کە مافی

هەڵبژاردنی نوێنەریان هەیە.

**حوزەی حزبی:** بنکەی حیزبی؛ چکۆلەترین یەکەی حیزبی کە لە کۆ بوونەوەی چەن کەس لە ئەندامانی حیزب پێکدێ.

**حوزەی رأی‌گیری:** بنکەی دەنگدان؛ جێگای دانانی سندووقی دەنگەکان بۆ هاتنی خەڵکی بۆ دەنگدان.

**حوزەی علمیّه:** جێگایێ کە فێرکاری دینی تێدا ئەنجام دەدرێ.

**حوزەی فعالیت:** دەڤەری کار؛ ناوچەی کار؛ ئاقار یان گۆڕەپانی کار.

**حوصــله** / howsele, ho:sele/: [عربی]/اسم. تاقەت: ١. *[گفتاری]* تابشت؛ هێدکی؛ پشوو لەسەرخۆیی ‹کمی حوصله کن، درست می‌شود: کەمێ تاقەت بێنە، دروست دەبێ› ٢. لەش؛ تاو؛ هاز؛ تەڤا؛ تەیاری زەین بۆ ئەنجامدانی کارێ ‹حوصلەی هیچ کاری را نداشت: تاقەتی هیچ کارێکی نەبوو›.

▣ **حوصله به خرج دادن:** خۆ ڕاگرتن؛ تابشت هێنان ‹خیلی حوصله به خرج دادم و چیزی نگفتم: زۆرم خۆ ڕاگرت و هیچم نەگوت›.

**حوصلەی کاری یا کسی را نداشتن:** واز لە کەسێ یان شتێ نەبوون؛ لەشوو کەسێوی یا هەرمانێوە نەبیەی ‹دیگر حوصلەی خواندن ندارم: دیتر وازی خوێندنم نیە›.

**حوصله کردن:** تاقەت هێنان؛ تاقەت هاوردن؛ وێسان و هیچ کارێ نەکردن ‹کمی حوصله کن، درست می‌شود: کەمێ تاقەت بێنە، جێبەجێ دەبێ›.

**حوصلەی کسی را سر بردن:** *[مجازی]* کەسێک وەڕەز/ بێ‌تاقەت/ جاڕزکردن ‹این سر و صدا حوصلەی همەی ما را سر برد: ئەم هەرا و هوریایە هەموومانی وەڕەز کرد›.

**حوصلەی کسی سر رفتن:** *[مجازی]* ١. وەڕەز بوون؛ جاڕز بوون؛ بێ‌تاقەت بوون ‹از آن همه غرولند، حوصلەی همەی ما سر رفته بود: لەو هەموو ختە و بۆڵە هەموو جاڕز ببووین› ٢. داگیران؛ داگیریان؛ خەم و خەففەت داگرتن ‹از تنهایی حوصلەام سر رفت: لە تەنیایی داگیرام›.

**حــوض** / howz, ho:z/، ـها/: [عربی]/اسم. ئەستێرک؛ حەوز؛ برکە؛ بڕک؛ کوڕان؛ جۆرنە؛ ئاوگیرێکی دەسکرد و ڕووباز، چکۆلەتر لە ئەستێر ‹کنار حوض نشست تا دستش را بشوید: لە لای ئەستێرکەکە دانیشت دەسی بشوا›.

**حوضـچه** / howzče, ho:zče/، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. حەوزۆکە: ١. کوڕان؛ جۆرنە؛ ئەستێرکی چکۆلە ٢. چاڵێکی گەورەی دەورگیراو لە لای ئاوێکی گەورەوە (وەکوو دەریا و چۆم) ‹حوضچەی نمک‌گیری: حەوزۆکەی خوێگری› ٣. ئەستێر؛ ئەستێرک یان جێگایەک بۆ هەڵگرتنی تراو و ئەنجامدانی کار لە سەری ‹حوضچەی پرورش ماهی: ئەستێرکی بارهێنانی ماسی›.

**حوضـخانه** / howzxāne, ho:z-/، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[قدیمی]* حەوزخانە؛ ژوورێک (زۆرتر) لە ژێرزەویندا بە ئەستێرک و فوارەوە کە لە شارگەلی گەرمیاندا بۆ دانیشتن لە ڕۆژانی گەرمی هاویندا کەڵکی لێوەردەگرن.

**حوضـه** / howze, ho:ze/، ـها/: [عربی]/اسم. ١. ئاوەڕۆ؛ ناوچە یان دەڤەرێ کە ئاوەکانی دەڕێژێتە ناو زەریا، زەریاچە یان چۆمەوە ٢. بەراو؛ ناوچەیەک کە لە ئاوی ڕووبارێک تێراو دەبێ.

**حــول** / howl, ho:l/: [عربی]/اسم. ١. /حوالی/ ئاقار؛ پەگاڵ ‹حول محورش می‌چرخید: لە پەگاڵ خولگەکەیدا دەخولایەوە› ٢. توانایی؛ هێز؛ هاز؛ تەشە؛ تاو؛ گورە.

**حول و حوش** / howl-o-howš, ho:l-o-ho:š/، ـها/: [عربی]/اسم. پەگاڵ؛ دەور و پشت؛ دەور و پەشت؛ دەوراندەور؛ هاوێردۆر؛ هێل؛ دەور و بەر؛

پەڕانپـەڕ؛ کـەنارە و کـەنار؛ قـەراخ بێچـاخ؛ دۆرماندۆر.

**حولـه** / howle, ho:le ، ـها/: [؟]/اسم. خـاولی؛ هەولە؛ مەرحەمە؛ پشتەماڵ؛ پەشتەماڵ؛ پارچەی نەرم و کولکنی خۆ وشک‌کردنەوە.

**حولـــەای** / howle'î, ho:le'î/: [؟] صـــفت. مەرحەمەیی؛ هەولەیی: ١. شیاو بۆ خاولی ٢. لە چەشـن یـان وەکـوو خـاولی ‹پارچـەی حولـەای: قوماشی مەرحەمەیی›.

**حومـه** / howme, ho:me ، ـها/: [عربـی]/اسـم. ١. ئاقـار؛ هانقـاس؛ هانقـەراس؛ هانقـار؛ دەور و بەری ئاوەدانی ٢. دەور و بەر؛ ئاواییەک نێزیـک بە شار ‹ساکنان حومەی کرمانشاه: دانیشتوانی ئاقاری کرماشان›.

**حـی** / hay(y)/: [عربـی] صـفت. [ادبی] زینـدوو؛ زینوو؛ زینە؛ زندە؛ زنی ‹او حـیّ و حاضر جلو شما ایـستاده: ئـەوا زرپ و زینـدوو لـە بـەردەم ئێـوەدا ڕاوەستاوە›.

**حیا** / hayā/: [عربی]/اسم. شەرم؛ فـەدی؛ فهێـت؛ حەیـشۆ؛ چەشـووری؛ چـاوڕوو، ڕاف؛ شـەرم و شوورەیی؛ حەیا ‹خوب است که آدم کمی حیا داشته باشد: چاکە بنیادەم هێندێک شەرمی هەبێ›.

▣ **حیا کردن:** شەرم کردن؛ حەیا کردن ‹پسر حیا کن! این کارها خوب نیست: کوڕە شـەرم بکـە! ئـەم کارانە باش نیە›.

**حیات** / hayāt/: [عربی]/اسم. [ادبی] ژیـان؛ ژیـن؛ ژیوەی؛ ژی؛ ژیو؛ زندەگی؛ زینگی ‹حیات و ممات: ژیان و مەرگ›.

▣ **حیات وحش:** ژیـانی کـەژی؛ گیـانی کـەژی؛ ژیانی گیانلەبەرانی کێوی.

▣ **حیات داشـتن:** زینـدوو بـوون؛ زینـوو بـوون؛ زینگ بوون؛ لە ژیاندا بوون؛ زینـە بیـەی ‹آن موقع پدرم حیات داشت: ئەو کاتە بابم زیندوو بوو›.

**حیاتبخش** / hayātbaxš/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. [ادبی] گیانبەخش؛ بەخشێنەری ژیان یـان هـۆی درێژەی ژیـان ‹پرتـو حیـاتبخش خورشـید: تیـشکی گیانبەخشی هەتاو›. هەروەها: **حیاتبخشی**

**حیات‌وممات** / hayāt-o-mamāt/: [عربـی]/اسـم. [ادبی] ژیان و مـەرگ؛ بـوون‌ونـەبوون؛ مـەردە و ژیوەی؛ مەرگ‌وزیندەگی ‹حیات‌وممـات او بـە ایـن بحـث بـستگی دارد: ژیـان و مـەرگی بـەم باسـەوە بەسراوە›.

**حیـــاتی** / hayātî/: [عربـــی] صـــفت. حـــەیاتی: ١. ژیانی؛ زندەگی؛ زینـدەگی؛ پێوەندیـدار یـان سـەر بـە ژیانـەوە ‹فعالیّتهـای حیـاتی: کارگـەلی حەیاتی› ٢. زۆر گرینگ؛ بەسـتراوە بـە گیانـەوە ‹وجود آب و هوا برای جانداران حیاتی است: هـەبوونی ئاو و هەوا بۆ گیانەوەران حەیاتیە›.

**حیــاط** / hayāt ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. حـەوش؛ حەوشـە؛ هـەوش؛ هەسار؛ حەسـار؛ لامـەردوو؛ گۆڕایی ناو چار دیواری ماڵ ‹ساختمان حیـاط هـم دارد: خانووەکە حەوشەشی هەیە›.

▣ **حیاط خلوت** ☜ **حیاط‌خلوت**

**حیاط‌خلوت** / hayātxalvat ، ـها/: [از عربی]/اسم. حەوشەخەڵوەتی؛ حەوشـەی چکوولـەی پـشتی خـانوو ‹فقـط یـک حیـاط‌خلـوت کوچـک دارد: تـەنیا حەوشەخەڵوەتێکی چکوولەی هەیە›.

**حیث** / heys/: [عربی]/اسم. ١. [نامتـداول] جێگـە؛ جێ؛ یاگێ؛ شـوێن؛ شـۆن؛ لـۆر؛ ئاسـت ٢. هـۆ؛ سۆنگە؛ بۆنە؛ بەڵگە.

▣ **از حیث:** لە ئاستی؛ لە سـۆنگەی؛ لـە لایـەن؛ بارەوو ‹از حیث جا مشکل داریم: لە ئاستی جێگـەوە گرفتمان هەیە›.

**حیثیت** / heysîyyat/: [عربی]/اسم. وەج؛ ئابـڕوو؛ ئابوور؛ هیسمەت؛ ئەرزشت و برەو لە کۆمەڵـگادا ‹از حیثیّت خودمـان دفـاع مـی‌کـنیم: وەجـی خۆمـان دەپارێزین›.

**حیدری** / heydarî/: [عربـی] صـفت. حەیـدەری: ١. پێوەندیدار یان سەر بە تەریقەتی قوتبـەدین حەیـدەر سـۆفی ئێـرانی (٥٠٨ – ٦١٥ ک. م.)

٢. ـها/ شوێن‌کەوتووی ئەو تەریقەتە.

**حیران** / heyrān/: [عربی] *صفت.* حەیران؛ سەر سوورماو؛ سەرسڕماو؛ سەرسام؛ سەر لێ شێواو؛ واق‌وڕماو؛ هەیرو.

▣ **حیران شدن:** سەر سووڕمان؛ واق‌وڕمان؛ سەرسام بیەی؛ سەرەماسەی؛ سەر زڤڕان؛ پەشۆکان؛ تاسان؛ مات بوون؛ وڕ بیەی؛ تووشی سەرسووڕماوی و سەر لێ شێواوی هاتن ‹از آن همه زیرکی حیران شدم: لەو هەموو وریاییە سەرم سووڕما›.

**حیران کردن:** حەیران‌کردن؛ مات‌کردن؛ گێژ و وڕکردن؛ وڕ و کاس‌کردن؛ تەرتلاندن؛ کلمساندن؛ کەوشاندن؛ سەرسام کەردەی؛ تووشی سەرسووڕماوی و سەر لێ شێواوی کردن ‹رفتار او مرا حیران کرد: ئاکاری، منی مات کرد›.

**حیران ماندن:** وڕ و کاس بوون؛ مانەوە؛ مات بوون؛ کلمسین؛ بشکفین؛ کەوشین؛ تەرتلین؛ مەنایوە؛ سەرسووڕماو و سەرگەردان مانەوە ‹از جوابی که داد حیران ماندم: لەو پەرسڤە دایەوە مات بووم›.

**حیرانی** / heyrānî ، ـها/: [عربی]/*اسم.* سەرسامی؛ سەرسووڕماوی؛ وڕی؛ مەنگی.

**حیرت** / heyrat/: [عربی]/*اسم.* سەرسامی؛ سەرسووڕماوی؛ ڕاماوی؛ واق‌وڕماوی؛ هیدمان؛ بار و دۆخ و چۆنیەتی لە دەست دانی توانای هەڵسانگاندنی ڕووداوگەل و بڕیار دان لە سەریان ‹من هم دچار حیرت شدم: منیش تووشی سەرسامی هاتم›.

▣ **در حیرت ماندن:** سەرسام مانەوە؛ سەرسووڕماو بوون؛ ڕاماو بوون. هەروەها: **حیرت کردن؛ دچار حیرت شدن**

**حیرت‌انگیز** / heyratangîz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* سەرسووڕێنەر ‹رفتار من برایش حیرت‌انگیز بود: ئاکاری من بۆی سەرسووڕێنەر بوو›.

**حیرت‌آور** / heyratāvar/: [عربی/ فارسی] *صفت.* سەرسووڕێنەر؛ سەرسامی‌هێنەر ‹این اوضاع حیرت‌آور است: ئەم دۆخە سەرسووڕێنەرە›.

**حیز** / hayyez/: [عربی] /*اسم*/ /*ادبی*/ جێگە؛ جێگا؛ جاگە؛ یاگێ: ١. جێ؛ شوێن؛ شۆن؛ لۆر؛ وار؛ ئاست ٢. /*مجازی*/ شوێنەوار.

▣ **حیز امکان:** جێگەی ڕوودان؛ ئاستی ڕەخسان/ شیان ‹این امر در حیز امکان نیست: ئەم کارە لە ئاستی ڕەخساندا نیە›.

**حیز انتفاع:** پلەی کەڵک وەرگرتن؛ ئاستی کەڵک لێ وەرگرتن ‹کتاب را از حیز انتفاع ساقط کردی: کتێبەکەت لە پلەی کەڵک وەرگرتن خست›.

**حیص وبیص** / heys-o-beys/: [عربی]/*اسم.* بگرە و بەردە؛ گیر و داو؛ گرم و قاڵ؛ هەڵلا هەڵلا؛ گوڕە و چەقە؛ چەقە و هەرا؛ گاڵەگاڵ؛ هەرەمەزات؛ گوڕمۆڕە؛ گێرە و کێشە؛ قاڵ و مەقاڵ ‹در آن حیص‌وبیص تو به فکر پول گرفتن بودی؟!: لەو بگرە و بەردەدا لە بیری پارە وەرگرتن بووی؟!›.

**حیض** / heyz/: [عربی]/*اسم.* حەیز؛ پۆن؛ پیار؛ پیسار؛ مەهەک؛ مەهک؛ مەهکی؛ بێ‌نوێژی؛ بێ‌نمایی؛ سەرخوێن؛ خوێنی مانگانە؛ عادەتی ژنانە.

**حیطه** / hîte ، ـها/: [عربی]/*اسم.* شوێنەوار: ١. پەرێز؛ نێو سنوور؛ شتێ کە خاوەن سنوورێکی ڕاستی یان دانراوە بێ ٢. پانایی؛ بەر؛ گۆڕەپانی کار و چالاکیەک.

▣ **حیطەی اختیارات:** سنووری دەسەڵات؛ شوێنەواری دەسچوویی؛ گۆڕی دەسەڵات؛ بەری دەسەڵات ‹باید حیطەی اختیارات مدیرعامل شرکت مشخص شود: ئەبێ شوێنەواری دەسەڵاتی سەرۆکی مەزرینگە دیاری بکرێ›.

**حیطەی عمل:** گۆڕەپانی کار؛ بەری کار؛ پانایی کردەوە؛ گۆڕی گوروە ‹شایستگی او در حیطەی

عمل معلوم می‌شود: لێهاتوویی ئەو لە گۆڕەپانی کاردا دیاری دەدا›.

▣ **به حیطه‌ی تصرف درآوردن**: گرتن؛ داگیر کردن؛ دەس بە سەردا گرتن؛ هێنانە ژێر ڕکێفی خۆ.

**حیف** /heyf/: [عربی] صوت. مخابن؛ داخ؛ ئاخ؛ حەیف؛ داخ و دەرد؛ وشەی پەشێوی کە لە کاتی لە دەس‌دانی کەسێ یا شتێ یان لە نەبوونیاندا بە کار دەڕوا ‹حیف کە پول نداریم: مخابن پارەمان نیە›.

▣ **حیف آمدن**: داخ لێ هاتن؛ حەیف لێ هاتن ‹حیفش آمد آن را پاره کند: داخی لێ دەهات بیدڕێ›.

**حیف بودن**: جێی داخ بوون؛ حەیف بوون ‹حیف بود که کتاب به آن خوبی را ارزان ت فروختی!: جێی داخ بوو کتێبێ بەو باشیەت هەرزان فرۆشت!›.

**حیف شدن**: حەیف بوون؛ جێی داخ بوون ‹حیف شد تو نیامدی: حەیف بوو نەهاتی›.

**حیف و میل** /heyf-o-meyl/: [عربی] اسم. ١. کار یان ڕەوتی فێرۆدان؛ خەساردان؛ خراوکردن و لە کار خستن ‹آن همه دارایی حیف و میل شد: ئەو هەمکە ماڵ و سامانە فیرۆ درا› ٢. کار و ڕەوتی هەلکێشان؛ بە ناڕەوا دەست بەسەر ماڵێکدا گرتن ‹در آن سازمان چقدر حیف و میل کردی؟: لەو مەزرینگەیەدا چەندت هەلکیشا!›.

**حیل** /hîyal/: [عربی] جمعِ ☜ **حیله**

**حیلت** /hîlat، ـها/: [عربی] اسم. [ادبی] فێڵ و فریو.

**حیله** /hîle، ـها؛ حِیَل/: [عربی] اسم. فێڵ؛ فێلک؛ فڕ و فێڵ؛ گزی؛ گغنی؛ گەڕ؛ هاوانتە؛ چێل؛ فریو؛ ڕێو؛ ئاوانتە؛ کەلەک؛ دەقلی؛ دۆم؛ پاختە؛ فرت؛ دۆلاب؛ قەسس؛ لەبان؛ گەف؛ گەڕوگوڕ.

**حیله گر** /hîlegar، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. فێڵباز؛ گزیکەر؛ گزیکار؛ کەلەکباز؛ داولێدەر؛ گڕنی‌باز؛ چەتلەمەز؛ تەپڕەش؛ ڕیپۆ؛ دەغوول؛ فێلوو؛ دەغلباز؛ هەنگباز؛ سۆر؛ حەکەباز؛ حەکار؛ دۆمدار؛ قەلبەزەن؛ زەقەل؛ گەڕساز؛ بە توانا یان هۆگری کەلک وەرگری لە فێڵ ‹روباه حیله‌گر: ڕێوی فێڵباز›. هەروەها: **حیله‌گری**

**حین** /heyn, hîn/: [عربی] اسم. کات؛ ئان؛ چاخ؛ دان؛ تان؛ گاف؛ وەخت ‹در این حین او هم رسید: لەم کاتەدا ئەویش گەیشت›.

**حیوان** /heyvān، ـها؛ ـات/: [عربی] اسم. گیانەوەر: ١. حەیوان؛ زیندەوەر ‹حیوان وحشی: حەیوانی دەشتەکی› ٢. گیاندار ‹انسان حیوان ناطق است: مرۆڤ گیانەوەرێکی ئاخێوەرە›.

**حیوان‌صفت** /heyvānsefat، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. دڕ؛ دڕندە؛ خاوەن خووی حەیوانی.

**حیوانی** /heyvānî/: [عربی] صفت. حەیوانی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە زیندەوەرەوە ‹روغن حیوانی: ڕۆنی حەیوانی› ٢. وەکوو حەیوان ‹زندگی حیوانی: ژیانی حەیوانی› ٣. *[مجازی]* دڕی؛ دووری لە شارستانیەت ‹رفتار حیوانی: ئاکاری حەیوانی›.

**حیوانیت** /heyvānîyyat/: [عربی] اسم. دڕندەیی؛ دڕی؛ دڕندەخۆیی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی حەیوان بوون.

**حی و حاضر** /hayy-o-hāzer/: [عربی] صفت. زیت‌وزیندوو؛ زرپوزنی؛ زرپوزینگ ‹ببین، آرام حی‌وحاضر است و می‌تواند شهادت بدهد: بڕوانە، ئارام زرپوزیندووە و دەتوانێ شایەتی بدا›.

**حیوونی** /heyvûnî/: [از عربی] صوت. *[گفتاری]* بەستەزمان؛ بەسەزوان؛ وشەیەک بۆ نیشان دانی بەزەیی هاتنەوە بە گیاندارێکدا ‹حیوونی گربه رفت زیر ماشین: پشیلەی بەستەزمان کەوتە ژێر ماشینەوە›.

**حیه** /hayye/: [عربی] ☜ **مار-١**

# خ

**خ** / x/: *حرف.* خ؛ نیشانەی نۆهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**خ** / xe/: *اسم.* خێ؛ ناوی نۆهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**خا** / xā/: *اسم.* ١. خا؛ ناوی عەرەبی نۆیەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی ٢. جاو.

**خائف** / xā'ef/: [عربی] ☜ **خایف**

**خائن** / xā'en/: [عربی] ☜ **خاین**

**خائیدن** / xā'îdan/ ☜ **خاییدن**

**خاتم**¹ / xātam ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ١. *[ادبی]* ئەنگوستیلە؛ کلکەوانە؛ ئەنگوسوانە؛ ئەنگوشتەر ٢. *[ادبی]* مۆرخوانە؛ مۆرخانە؛ مۆرخەوانە؛ نقێم؛ بەردەئەموستیلە؛ قاشەئەنگوستیلە؛ نگینی ئەنگوستیلە ٣. خاتەمکاری.

**خاتم**²: *صفت.* دوایین؛ دوامین؛ دواگین؛ دوایەمین؛ دواهەمین؛ دماگین؛ دمایین؛ دمەین؛ ئەوپەڕین؛ ئاخرین ‹خاتم انبیاء: دوایین پێغەمبەر›.

▣ **خاتم انبیا**: ١. دوایینی پێغەمبەران؛ ئاخرین پێغەمبەر؛ ئاخرینی پێغەمبەران ٢. نازناوی پێغەمبەری ئیسلام، لای موسوڵمانان.

**خاتمکاری** / xātamkārî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ١. هونەر یان فەنی جوانکاری بە بڕین و پێکەوە لکاندنی لەتە ئێسک و چێو لە پەنای یەکتر ٢. /ها/ بەرهەمی ئەو هونەرە. هەروەها: **خاتمکار؛ خاتمساز؛ خاتمسازی**

**خاتمه** / xāteme/: [عربی]/*اسم.* کۆتایی؛ دوایی؛ دمایی؛ بنەتا؛ ئەنجام.

▣ **خاتمەی کار**: کۆتایی کار؛ دوایی کار؛ ئاخری کار ‹خاتمەی کار دادگاه اعلام شد: کۆتایی کاری دادگا ڕاگەیێندرا›.

**در خاتمه**: لە کۆتاییدا؛ لە دواییدا؛ لە ئاخردا؛ جە دماییینە؛ لە ئاخرەوە؛ لە ئاکامدا ‹در خاتمه دلیل جرمش را اعلام کرد: لە کۆتاییدا هۆکاری تاوانەکەی ڕاگەیاند›.

▣ **خاتمه دادن**: دوایی (پێ) هێنان؛ کۆتایی (پێ) هێنان؛ تەواوکردن؛ قەدداندن؛ تەمامنەی ‹کار را خاتمه داد: کارەکەی دوایی پێ هینا›.

**خاتمه دادن به خدمت کسی**: کۆتایی هێنان بە کاری کەسێک؛ کەسێ لە سەر کارەکەیەوە وەدەرنان؛ کەسێک لە سەر کاریەوە لابردن/ دەر کردن ‹از امروز به خدمت شما خاتمه داده می‌شود: لە ئەوڕۆوە کۆتایی بە کاری ئێوە دەدرێ›.

**خاتمه یافتن**: دوایی هاتن؛ کۆتایی هاتن؛ کۆتایی پێهاتن؛ تەواو بوون؛ قەتیان؛ قەدیان؛ دما ئامەی؛ هەرادیای؛ تەمامیەی ‹گردهمایی در ساعت ١٠ خاتمه یافت: کۆبوونەوەکە کاتژمێری ١٠ دوایی هات›.

**خاتون** / xātûn ، ـها؛ خواتین/: [ترکی]/اسم. [قدیمی] خاتوون؛ خاتون؛ خاتوونه؛ خات؛ کابان؛ کەیبانوو؛ کەیوانۆ؛ کەبانوو.

**خاج** / xāc ، ـها/: [ارمنی]/اسم. [گفتاری] ۱. سەلیب؛ خاچ؛ چەلیپا؛ چقر؛ چەپوڕاست ۲. خاچ؛ خاڵی وەرەقی کایە ، وێنەی گەڵای گژنیز: **گژنیز؛ گشنیز**

**خاج‌پرست** / xācparast ، ـها؛ ـان/: [ارمنی/ فارسی]/اسم. [گفتاری] مەسیحی؛ فەلە؛ خاچ‌پەرست؛ عیسایی.

**خاجی** / xācî/: [ارمنی] صفت. خاچی؛ سەلیبی؛ بە وێنەی خاچ ‹استخوان خاجی: ئێسقانی خاچی›.

**خاخام** / xāxām ، ـها/: [عبری]/اسم. خاخام؛ مەلای جوو؛ پێشەوای دینی یەهوود.

**خادم**[1] / xādem ، ـها؛ ـان؛ ـین؛ خُدّام؛ خَدَم؛ خَدَمه/: [عربی]/اسم. ۱. [قدیمی] بەردەست؛ خزمەتکار؛ پاکار؛ خزمەتچی ۲. خایەم؛ خادم؛ مجەور؛ مجێور؛ خزمەتکاری دامەزراوەی ئایینی ‹خادم مسجد: مجێوری مزگەوت›.

**خادم**[2]: صفت. [ادبی] خزمەتکار؛ خاوەنی پێشینەی ئەنجامدانی کار بە قازانجی کەس یان کەسانی دیکە ‹این دانشمند یک عمر خادم ملک و ملت بود: ئەم زانایە هەموو ژیانی خزمەتکاری خەڵک و وڵات بوو›.

**خار** / xār ، ـها/: اسم. ۱. درووو؛ درو؛ درک؛ دڕی؛ دڕێ؛ دڕەی؛ ڕوو؛ چقڵ؛ چقوڵ؛ چوقڵ؛ چەقڵ؛ کوورە؛ زیادەی دەرزی‌ئاسای ڕووەکان ۲. هەر بنەگیایەکی دڕوودار ۳. ئەوەی وەها بیچمێکی هەبێ ٤. [صنعت] جۆرە میلەیەکی چکۆلە بە دەرپەڕیوی یان چالییەکەوە کە لە هەندێ کاری پەیوەند کردن و بڕێ پێچ یان پەرچدا کەڵکی لێ‌دەگرن ٥. [مجازی] جەخار؛ ڕەنج؛ ئازار.

⊡ **خار از پای کسی کندن:** [کنایی] درووو لە لەشی کەسێک دەرهێنان؛ باری کەسێ هەڵگرتن؛ بە هانای کەسێکەوە هاتن؛ یارمەتی دان و خزمەتی کەسێ کردن.

**خار در جگر داشتن:** [مجازی] خوێنـاو هەڵهێنان؛ زووخ لە دڵدا بوون؛ دڵ پڕ لە داخ بوون؛ دەروون پڕ پەژارە بوون.

**خار در چشم کسی بودن:** [مجازی] چقڵی چاوی کەسێک بوون؛ بوونە هۆی ڕق و زیزی کەسێ ‹شور و شوق جوانان خار در چشم ارتجاع است: کورد و کۆشی گەنجان چقڵی چاوی کۆنەپەرستیە›.

**خار راه کسی شدن:** [کنایی] بوونە دڕکی مەم و زینان لە ڕێی کەسێ؛ بوونە لەمپەر بۆ گەیشتنی کەسێک بە مەبەستی.

**خارا** / xārā/: اسم. ۱. خارا؛ گرانیت؛ چەشنێ ئاگرە بەردی دەنک درشتی ئەسیدییە.

**خاراگوش** / xārāgûš ، ـها/: اسم. گورزەگیا؛ گیاهەنگی؛ ئاڵفە گیاییکی خۆڕسکە نیومیتر بەرز دەبێ، گوڵی زەرد دەکا و بۆنی گەز و توندە.

**خاراندن** / xārāndan/: مصدر. متعدی. // **خاراندی:** خوراندت؛ **می خارانی:** دەخورێنی؛ **بِخاران:** بخورێنە// خوراندن؛ خورانن؛ خوەراندن؛ قەخوراندن؛ ورنەی؛ قامک، نینۆک یان شتێکی زبر و زوور هێنانە پێستی لەشدا ‹پشت خاراندن: پشت خوراندن›. هەروەها: **خاراندنی**

■ صفت مفعولی: **خارانده** (خورێنراو)/ مصدر منفی: **نَخاراندن** (نەخوراندن)

**خاربن** / xārbon/: اسم. وەرەک؛ پنجە دڕکی دەر و دەشت.

**خارپشت** / xārpošt ، ـها؛ ـان/: اسم. ۱. ژیشک؛ ژووژوو؛ ژیژوو؛ ژیژۆ؛ ژژوو؛ ژیژی؛ ژویژی؛ چولپە؛ گیانداریکی گوانداری شت‌جوێن، داپۆشراو لە دڕکی باریک و نووک‌تیژ، کە بە سانایی لێی دەبێتەوە، بەڵام ناتوانێ بە ویستی خۆی بیهاوێژێ ۲. سیخور؛ سیچڕ؛ سووچڕ؛ سیخ‌چوولە؛ گیانەوەرێکی گوهانداری شەوگەڕی دونیای کۆن (ئەورووپا، ئاسیا و ئافریقا) لە

ڕاسته‌ی مێرووخۆران، که پێستی سه‌رووی له‌شی دڕکاویه و ده‌توانێ به‌ره‌و هه‌ر لایه‌ک بیانهاوێ.

**خارپشت‌ماهی** / xārpoštmāhî/ ☜ ماهی خاردار، **ماهی**[1]

**خارج**[1] / xārec/: [عربی]/اسم. ۱. ده‌ره‌وه؛ ده‌رۆ؛ ده‌ر؛ ده‌رێ؛ ده‌رقه؛ ده‌راهیا؛ به‌ر؛ قه‌ر؛ ئه‌وده‌ر ‹خارج کلاس: ده‌ره‌وه‌ی پۆل› ۲. *[گفتاری]* ده‌ره‌وه؛ به‌ره‌وه؛ هه‌نده‌ران؛ ولاتی بیانی؛ لاوه‌کی ‹خارج درس خوانده: له ده‌ره‌وه خوێندوویه‌تی› ۳. *[شیعه]* خارج؛ خولی بالای خوێندنی مه‌زهه‌بی شیعه.

**خارج**[2]: *قید.* ده‌ره‌وه: ۱. ده‌ر له؛ له ده‌ره‌وه؛ له ده‌رێ؛ له ده‌ر؛ له ده‌رۆ؛ جیا یان دوور له ڤالایی، ناوان یان گرۆیه‌ک ‹خارج از کشور: له ده‌ره‌وه‌ی ولات› ۲. *[گفتاری]* به‌ر؛ ئه‌و به‌ر؛ ده‌رۆ؛ ده‌رێ؛ ده‌شت؛ ده‌یشت؛ به ده‌ر له شوێنێک ‹ببر خارج: ببیه ده‌ره‌وه› ۳. *[گفتاری]* ده‌ری؛ به‌ره‌وه؛ له ده‌ره‌وه‌ی شوێنێک ‹سطل را گذاشته بود خارج از آشپزخانه: سه‌تڵه‌که‌ی له ده‌ره‌وه‌ی ئاشپه‌زخانه دانابوو›.

▣ **خارج از ساعت کار:** جیا له کاتی کار؛ کاتی جگه له ماوه‌ی فه‌رمی کار ‹خارج از ساعت کار کسی در اداره نمی‌ماند: جیا له کاتی کار که‌س له مه‌زرینگه‌دا نامێنێته‌وه›. هه‌روه‌ها: **خارج از وقت**
**خارج از نوبت:** به نۆبه‌بڕی؛ به نۆبه‌بڕکێ؛ به نۆبه‌بڕکه؛ وه نۆره‌بڕی؛ به‌بێ ڕه‌چاوکردنی نۆره و زۆرتر پێش له‌وه ‹می‌خواست خارج از نوبت کارش را راه بیندازد: ئه‌یویست به نۆبه‌بڕی کاره‌که‌ی بخاته ڕێ›.

▣ **خارج خواندن:** *[موسیقی]* لادان؛ له‌گه‌ڵ ده‌زگا یان ئاهه‌نگ و هه‌وادا ڕێک نه‌بوون.
**خارج شدن:** چوونه ده‌ر؛ چوونه ده‌شته‌وه؛ ڕۆینه ده‌ره‌وه؛ چوونه ده‌رۆ؛ زیه‌یره؛ ئه‌ره‌زیه‌ی؛ لوه‌ی به‌ر ‹از خانه خارج شدن: له ماڵ چوونه ده‌ر›.

**خارج کردن/ ساختن:** ده‌رکردن؛ بردنه ده‌ره‌وه؛ هێنانه ده‌ره‌وه؛ کردنه ده‌ره‌وه؛ زنیایره؛ ئه‌ره‌زنیه‌ی؛ به‌رده‌ی به‌ر ‹او را در حال خارج کردن اشیاء گرفتند: له کاتی ده‌رکردنی شته‌کاندا گرتیان›.

**خارج‌قسمت** / xārec(e)qesmat، ـها/: [عربی] *اسم. [ریاضی]* به‌رکه‌وت؛ به‌رکه‌ت؛ ده‌سهات و ئاکامی دابه‌ش کردن ‹اگر ۱۰۰ را به ۵ قسمت کنیم، خارج‌قسمت می‌شود ۲۰: ئه‌گه‌ر ۱۰۰ بکه‌ینه ۵ به‌شه‌وه، به‌رکه‌وته‌که‌ی ده‌بێته ۲۰›.

**خارجه** / xārece/: [عربی/ فارسی]/اسم. ده‌ره‌وه؛ به‌ره‌وه: ۱. هه‌نده‌ران؛ ولاتی بیانی؛ ولاتی نامۆ؛ ولاتی لاوه‌کی ‹رفته بود خارجه: ڕۆیشتبووه هه‌نده‌ران› ۲. هه‌ر شوێنێ له ئه‌و دیوی سنووری ولاتێکه‌وه ‹اخبار خارجه: ده‌نگ‌وباسی ده‌ره‌وه›.

**خارجی**[1] / xārecî/: [عربی]/اسم. ۱. /خوارج/ *[قدیمی]* خه‌واریج؛ هه‌ر یه‌ک له هۆگرانی ده‌سته‌یه‌ک که له چه‌رخی هه‌وه‌ڵی کۆچیدا، شه‌ڕی عه‌لی و معاویه‌یان به حه‌رام زانی و پێشه‌وایی هیچیان په‌سند نه‌کرد ۲. /ـها؛ ـان/ لاوه‌کی؛ بیانی؛ ده‌ره‌کی؛ خه‌ڵکی ولاتی بیانی ‹دوتا خارجی هم توی آن هتل بودند: دوو که‌سی بیانیش له‌و ئۆتێله‌دا بوون›.

**خارجی**[2]: *صفت.* ده‌ره‌کی: ۱. لاوه‌کی؛ بیانی؛ پێوه‌ندیدار یان سه‌ر به ولاتی بێگانه‌وه ‹پول خارجی: دراوی ده‌ره‌کی› ۲. له ده‌ره‌وه ‹دیوار خارجی: دیواری ده‌ره‌کی›.

**خارخسک** / xārxasak، ـها/: اسم. پێکۆڵ؛ پێکۆڵ؛ په‌یکۆڵ؛ په‌یکول؛ په‌یکوڵه؛ پێکوڵه؛ پێکولی؛ په‌یکۆڵێ؛ کونجرکه؛ قونجر؛ قونجرکه؛ دڕه‌سووچه؛ سێ‌چوکڵ؛ سێ‌دانه؛ سێ‌ددانه؛ سێ‌دیانه؛ دڕکێکی سێ‌سووچه به زه‌ویدا پان ده‌بێته‌وه و دانه‌کانی بۆ ده‌رمان ده‌شێ.

**خاردار** / xārdār/: *صفت.* دڕکاوی؛ دڕکدار؛ دڕکین؛ چقڵاوی؛ خاردار؛ به‌چقڵ؛ دڕاوی؛

درکال؛ درکۆڵ؛ پڕدرک ‹بوتەی خاردار: دەوەنی درکاوی›.

**خارستان** / xār(e)stān/: *اسم.* درکەجاڕ؛ درکەزار؛ درکەسان؛ جێگەی دڕوان؛ شوێنی پڕچقڵ.

**خارش** / xāreš/: *اسم.* حەکە؛ هکە؛ ئالۆش؛ خارشت؛ خوروو؛ کلاش؛ کلاشە؛ کلاشەخورە؛ خارش؛ کرکلاش؛ وورِ؛ گەزنەک؛ ڕەوتی پەیدا بوونی بزوێنە یان هەستەوەرێک لە لەشدا کە دەبێتە هۆی ئالۆش لێ پەیدابوونی ئەو جێگەیە.

**خارشتر** / xāršotor، ـها/: *اسم.* حوشترالۆک؛ حوشترئالووک؛ هوشترالۆک؛ وشترخۆرکە؛ وشترخار؛ وشترخوەرە؛ حوشترخۆرە؛ شیرحوشتر؛ وشتردرک؛ درکەژاڵ؛ کۆلەوار؛ یانداخ؛ عەگول؛ عاگول؛ کاویر؛ ستریشینکە؛ ستریشینک؛ بنەگیایەکی گەڵا جووتی دوور لە یەکە بە درکی درێژ و سەوزەوە، ماکێکی شیرین بە ناو تورەنجەبین دەدەڵێنێ: **شترخار**

**خارشک** / xārešak/: *اسم.* [گفتاری] ١. گاڵ؛ نەخۆشیەکی گیرۆی پێستە هاوڕێ لەگەڵ زیپکە (بەتایبەت لە سەر پێستی دەست) و خورووی زۆردا ٢. ئاڵشت؛ ئالۆش؛ خارشت.

**خارشکر** / xāršekar، ـها/: [فارسی/ سنسکریت] *اسم.* شەکرۆکە؛ شەکرووکە؛ شەکرۆ؛ شەکروو؛ قەنشەکرۆک؛ قەنشەکیرووک؛ شەکرەشوانە؛ شەکرەتۆسی؛ سەرتەشی؛ سەلکەتەشی؛ سەرکەتەشی؛ کەرتەشی؛ درکەگورزە؛ گیاییێک بە سەلکێکی فری زۆر درکاوی و گوڵی سپی ئاماڵ شینەوە، ماکێکی قەندی دەدەڵێنێ کە بۆ دەرمان ئەشێ.

**خارق‌العاده** / xāreqol'āde/: [عربی] *صفت.* سەرسووڕێنەر؛ سەیر؛ سەمەرە؛ سەیر و سەمەرە؛ هەژەند؛ دوور لە بار و دۆخ یان چۆنیەتی ئاسایی ‹کار خارق‌العاده: کاری سەرسووڕێنەر›.

**خارک** / xārak، ـها/: *اسم.* خورمای زەرد و وشک.

**خارکن** / xārkan، ـها؛ ـان/: *اسم.* [قدیمی] پووشکەچن؛ کەسێ کە درک و داڵی لە چۆلگە و بیاوان کۆ دەکردەوە و وەک سووتەمەنی بە کڕیارانی دەفرۆشت.

**خارکنی** / xārkanî/: *اسم.* [قدیمی] پووشکەچنی؛ پیشەی پووشکەچن.

**خارماهی** / xārmāhî/: *اسم.* دەڕەماسی؛ دڕەماسی؛ جۆرێ ماسی کە لای سەر و بەشی دواییی لەشی باریک و تیژە و لە درک دەکا.

**خار و خسک** / xār-o-xasak/: *اسم.* [ادبی] درک و داڵ؛ پووش و پەڵاش؛ گیای وشکەوە بووی بابردەڵە.

**خاریدن** / xārîdan/: *مصدر. متعدی. لازم.* //**خاریدی**: خوراندت؛ **می خاری**: دەخورێنی؛ **بخار**: بخورێنە// □ *متعدی.* ١. خوراندن؛ قەخوراندن؛ ورنەی؛ بە نینۆک کرِاندن ‹این‌قدر سرت را خاریدی که خون آمد: ئەوندە سەرت خوراند خوێنی لێ هات› □ *لازم.* ٢. خوران؛ خوریان؛ وریەی؛ شەرمخین؛ کرکان؛ وە خرۆ هاتن؛ ئالۆش لێ پەیدا بوون؛ هاتنە خوران؛ کەوتنە خوران ‹پشتم می‌خارد: پشتم ئەخورێ›.

■ صفت فاعلی: **خارنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **خاریده** (خورێنراو)/ مصدر منفی: **نخاریدن** (نەخوراندن)

**خازن** / xāzen، ـها/: [عربی] *اسم.* ١. کەرەسەیەک بۆ لە خۆ گلدانەوە و نۆتە کردنی وزەی کارەبا ٢. ـان/ [قدیمی] خزنەدار؛ خەزنەدار؛ خەزێنەدار؛ نیگابانی خەزێنە؛ کەسێ کە چاوەدێری پووڵ و پارەی شوێنێکی لە ئەستۆدایە.

**خازنه** / xāzene/: *اسم.* ژنخوشک؛ ژنخۆیشک؛ گۆرم؛ خوشکی ژن (هاوسەر).

**خاس** / xās، ـها؛ ـان/: *اسم.* دەوەن و دارچکێکی هەمیشە شینی گەڵا ساف و ڕۆشن، بە ڕەنگی سەوزی تۆخ و پانکەلەی درکاویە، گوڵەکانی

سپی یان ئاڵ و بە کۆما لە پەنای گەڵاکانیدا هەڵدەدەن، بەرێکی سووری بریکەدار و جاربەجار زەرد، بە قەدەر نۆکێک دەگرێ کە چوار یان پێنج دەنکە تووی تێدایە: **راج**

**خاستگاه** / xāstgāh ، ـها/:اسم. ئاخێزگە؛ سەرچاوکە؛ سەرچاوگە؛ بنەما؛ جێیەک کە شتێکی لێ‌سەرهەڵدەدا، یان تێیدا بەدی دێ ‹بسیاری آسیای صغیر را خاستگاه فلسفەی غرب می‌دانند: زۆرێک ئاسیای چکۆلە بە ئاخێزگەی فەلسەفەی ڕۆژاوا دەزانن›.

**خاش** / xāš/:اسم. خەسوو؛ خەس؛ هەسروە؛ خەسوی؛ دایکی هاوسەر (ژن یان مێرد).

**خاشاک** / xāšāk ، ـها/:اسم. چیلکە؛ پووش؛ پڕ و پووش؛ پرپیش؛ پووش و پەلاش؛ قاڵ؛ قرشک؛ قرش؛ خەش‌وخاڵ؛ خرت و خەوش؛ خاشاڵ؛ خاشە؛ خاش؛ گەرش؛ گەرش و گێڵ؛ گزرە؛ چکاڵ؛ چڕ؛ پووشکە؛ چاڵ؛ چڵ‌وچێو؛ چڕوچێو؛ چڕوچیلکە؛ پووش‌وپار؛ پەلاش؛ ئاژاڵ؛ ورد و خاشی تۆلاش و گژ و گیا.

**خاص** / xās(s)/: [عربی] *صفت*. تایبەت: ۱. تەنیا بۆ شتێ، کەسێک یان چینێک. بەرانبەر: **عام** ‹اسم خاص: ناوی تایبەت› ۲. بە چۆنیەتیەکی هەڵکەوتە و زەق ‹نوع خاص: جۆری تایبەت›.

**خاصره** / xāsere/: [عربی]/اسم. خالیگە؛ هالیگە؛ لابرک؛ پووتەگا؛ قەبرغە؛ قەورخە.

**خاصه**[1] / xāsse ، ـها؛ خواص/: [عربی]/اسم. *[نامتداول]* تایبەتمەندی؛ گەوشین.

**خاصه**[2]: *صفت*. تایبەت؛ تایبەتی؛ گەوشت.

**خاصه‌خرجی** / xāssexarcî ، ـها/: [عربی]/اسم. *[گفتاری]* هەڵەخەرجی؛ بلەخەرجی؛ وێڵ‌خەرجی؛ دەست‌بڵاوی لە بابەتێکی دیاریکراو یان بۆ مەبەستێکی تایبەت (زیاتر بۆ کڕینی کەلپەلی ڕازاوە) ‹این پول برای گذران یک ماه همەی ماست، قرار نیست تو از آن خاصه‌خرجی کنی: ئەم پارە ئی مانگێکمانە، ناکرێ تو هەڵەخەرجی پێ بکەی›.

**خاصیت** / xāsîyyat ، ـها؛ خواص/: [عربی]/اسم. ۱. دانستە؛ تایبەتمەندی؛ تایبەتایەتی؛ گەوشین؛ چۆنیەتی یان نیشانەی پێوەندیدار بە کەسێ یان شتێکەوە ‹گرما و سوزندگی خاصیت آتش است: گەرما و سووتێنەری دانستەی ئاگرن› ۲. *[گفتاری]* کارکۆیی؛ کاریگەری؛ کار تێکردنێ کە شتێ لە سەر شتێکی دیکە یان لە سەر هەستەوە دایدەنێ ‹این دوا هیچ خاصیتی نداشت: ئەم دەرمانە هیچ کارکۆییەکی نەبوو›.

▣ **خاصیت داشتن:** *[گفتاری]* بەکەڵک بوون؛ باش بوون؛ خاس بوون؛ هەبوونی کاریگەریەکی بەکەڵک یان چاک‌کەرەوە.

**خاطر** / xāter/: [عربی]/اسم. ۱. بیر؛ زەین ‹پریشان‌خاطر: بیربلاو› ۲. ـها/ یاد؛ ویر ‹بە خاطر آمدن: هاتنەوە بیر›.

▣ **برای خاطر کسی:** لە بەر کەسێ؛ لایین کەسیگ؛ وەروو یۆی؛ بۆ ڕەزامەندی کەسێک.

**بە خاطر چیزی/ کسی:** لە بەر شتێ/ کەسێ؛ وەروو چێویۆی؛ بە بۆنەی شتێک/ کەسێکەوە؛ بۆ یان بە هۆی شتێ یان کەسێکەوە ‹بە خاطر سرما این را پوشیدم: لە بەر سەرما ئەمەم لە بەرکرد›.

▣ **خاطر کسی را آزردن:** کەسێک ڕەنجاندن؛ بوونە هۆی ناڕەحەتی و ڕەنجانی کەسێ. هەروەها: **خاطر کسی را آسودە کردن**

**خاطر کسی را خواستن:** خۆش ویستن/ خۆش گەرەک بوونی کەسێک؛ یۆ وەش سیەی.

**از خاطر گذشتن** ☜ **بە خاطر آمدن/ رسیدن**

**بە خاطر آمدن/ رسیدن:** بە بیردا هاتن؛ بە مێشکدا هاتن؛ هاتنەوە بیر؛ ئامەیوە ویر: **از خاطر گذشتن**. هەروەها: **بە خاطر آوردن**

**بە خاطر گذشتن/ خطور کردن:** بە مێشکدا تێپەڕین؛ بە بیردا هاتن؛ بە مێشکدا هاتن.

**در خاطر ماندن:** لە یاد مانەوە؛ لە بیر مانەوە؛ ویرەنە مەنەی.

**خاطرات** / xāterāt/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **خاطره** ۲. بیرەوەری(گەل)؛ هەواڵی ڕووداو و سەربهوردەگەلی پێوەندیدار بە کەسێک یان سەردەمێکەوە ‹خاطرات دوران جوانی: بیرەوەری سەردەمی لاوی›.

**خاطرپریش** / xāterparîš/: [عربی/ فارسی] صفت. *[ادبی]* بیربلاو؛ پەرێشان؛ دڵبەخەم.

**خاطرپسند** / xāterpasand/: [عربی/ فارسی] صفت. *[ادبی]* دڵگر؛ دڵڕفێن؛ لەبار و بەرچاو.

**خاطرجمع** / xātercam'/: [عربی] صفت. دڵنیا؛ ئارخەیان؛ دابین؛ دڵهێسا؛ ئاسوودە؛ خاترجەم؛ دڵبجێ؛ بێخەم؛ دوور لە نیگەرانی ‹خاطرجمع باش! اتفاقی نمی‌افتد: دڵنیا بە! شتێ ڕوو نادا›.

**خاطرجمعی** / xātercam'î/: [عربی]/اسم. دڵنیایی؛ ئارخەیانی؛ ئاسوودەیی؛ بێخەمی.

**خاطرخواه** / xāterxāh/: [عربی/ فارسی] صفت. *[گفتاری]* ئەویندار؛ دڵدار؛ دڵپێداو؛ دڵار.

**خاطرخواهی** / xāterxāhî/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[گفتاری]* ئەوینداری؛ دڵداری؛ ئەشکی؛ هۆگری.

**خاطرنشان** / xāternešān/: [عربی/ فارسی] صفت. بیرهێنەر؛ بیرخەر؛ وەبیرهێنەر.

▣ **خاطرنشان شدن**: ڕاگەیێنران؛ وەبیر هاتنەوە ‹خاطرنشان می‌شود که او دیروز به خانه نیامده است: ڕادەگەیێنرێت کە دوێنێ نەهاتۆتەوە ماڵ›.

**خاطرنشان کردن**: ڕاگەیاندن؛ وەبیر هێنانەوە؛ خستنەوە بیر؛ وسەیوە هۆش ‹به آنان خاطرنشان کنید که ساعت کار تغییر کرده است: پێیان ڕاگەیێنن ساعەتی کار گۆڕدراوە›.

**خاطره** / xātere ، ـها؛ خاطرات/: [عربی]/اسم. ۱. بیرەوەری؛ هاتە؛ ڕووداو یان کارێ کە لە ڕابردوودا ڕوویداوەوە و لە یاددا ماوەتەوە ‹از دوره‌ی سربازی خاطره‌های زیادی داشت: لە دەورانی سەربازی بیرەوەری زۆری هەبوو› ۲. یاد؛ بیر؛ ویر؛ کردار و ئاکار یان تایبەتمەندیگەلی درەوشاوەی کەس، شت یان سەردەمێکی دیاریکراو لە ڕابردوودا ‹مردم خاطره‌ی شهیدان را گرامی داشتند: خەڵکی یادی شەهیدانیان بەرز ڕاگرت›.

**خاطی** / xātî ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. هەڵەکار؛ تاوانکار؛ تاوانبار؛ شەپنی؛ خەتاکار ‹انسان خاطی مجازات می‌شود: مرۆی تاوانبار سزا دەدرێت›.

**خاقان** / xāqān ، ـها/: [ترکی]/اسم. *[قدیمی]* قاقان؛ خاقان؛ نازناوێ کە ئێرانیەکان بە شاکانی چین و تورکستانیان دابوو ‹خاقان چین: قاقانی چین›.

**خاک** / xāk/: اسم. خاک: ۱. ـها/ گەرد و تۆزاڵێ کە بە هۆی ورد و خاش بوونی بەرد و ماکی سەرەتاییەوە دەڕسکێ ‹خاک آهکی: خاکی قسلی› ۲. زەوی؛ ئاخ؛ تۆژێکی ناسک لە پێستەی زەوی کە ئەم ماکانەی تێدایە ۳. زەوین؛ زەمین؛ هەر؛ بووم؛ بوومی؛ ئاخ ‹کره‌ی خاک: گۆی خاک› ٤. *[مجازی]* سەرزەوین؛ نیشتمان ‹خاک کردستان: خاکی کوردستان› ٥. *[مجازی]* گۆڕ؛ گڵکۆ؛ قەور؛ قەبر؛ قەبرە؛ زیارەت ‹رفته بودم سر خاک پدرم: چووبوومە سەر خاکی بابم› ٦. *[مجازی]* لاشە؛ تەرمی کەسێک بەتایبەت دوای داڕزان و ئاوقای گڵکۆ بوون ۷. خۆڵ؛ خوڵە؛ خۆر؛ تۆز؛ تۆزە؛ توزک ‹کتابها را خاک گرفته بود: کتێبەکان خاکیان لێنیشتبوو›.

▣ **خاکِ ارّه** ☜ **خاک‌اره**

**خاک آهکی**: خاکی قسلین؛ خاکی ئاهەکی؛ خاکی وا کە ماکی قسلی زۆری تێدایە.

**خاک برگ**: زمیچ؛ خەزەڵی ڕزاوی تێکەڵ بە خاک.

**خاک چرب**: خاکە سوورە؛ خوەڵەسوورە؛ چەشنێ خاکی سوورکار کە قورەکەی باش کێشیدێ.

**خاک چینی**: کائولێن؛ خاکی چینی؛ خاکی سپی.

**خاک رُس**: ئیربار؛ خاکەسوورە؛ خۆڵەسوورە؛ خاک‌سوەر؛ چەشنێ خاکی نەرمی دەنک وردە لە هەوڕگەری و کوورەخانانداا بەکار دێ.

**خاک رنگبر:** گڵی چەوری لابەر؛ گڵی چەوری سڕ ☜ **رُس**

**خاک هُوموسی:** خاکە ڕەشە؛ گڵە ڕەشە؛ خاکی زۆر نەخت و بەرهێنەر.

▣ **خاک برداشتن:** خاک هەڵگرتن؛ خاک هەڵکەندن؛ خاک لابردن.

**خاک بر سر کسی شدن:** *[کنایی]* قوڕ چوون بە سەر کەسێکدا؛ لە کەسێک قەومان و تووشی کارەساتی دڵتەزێن بوون ‹ببین چه خاکی به سرم شد: بڕوا چ قوڕێ چوو بە سەرما›.

**خاک پای کسی بودن:** *[مجازی]* خاکی بەر پێی کەسێ بوون؛ خاکی ژێر پێی کەسێ بوون؛ لە بەرامبەری کەسێکدا زۆر کەم بوون یان خۆ بە کەم زانین ‹می‌گفت خاک پای شما هستم: ئەیگوت خاکی بەر پێی ئێوەم›.

**خاک جایی دامنگیر بودن:** *[مجازی]* خاکی جێیەک دڵگیر بوون؛ بوونە هۆی مانەوەی کەسێ تێیدا ‹خاک کردستان دامنگیر است: خاکی کوردستان دڵگیرە›.

**خاک جایی را به توبره کشیدن:** *[کنایی]* ئاوی شوێنێک لە ئاوەڕۆیەوە دەرکردن؛ماڵی شوێنێک کردنە جاڕەپیواز؛ خاکی جێیەک بە توورەکە کێشان؛ جێگایەک تەواو کاول کردن ‹سپاه مغول خاک ایران را به توبره کشیدند: سپای موغول ئاوی ئێرانیان لە ئاوەڕۆیەوە دەرکرد›.

**خاک خوردن:** تۆز خواردن؛ تۆز لە سەر نیشتن ‹این کتاب مدتهاست در قفسه خاک می‌خورد: ئەم کتێبە دەمێکە لە بیرکمەکەدا تۆز دەخوا›.

**خاک در آش کسی کردن:** *[کنایی]* دڕک کردنە نێو ئاردی کەسێک؛ خۆڵ کردنە دۆشاو/ دۆی کەسێ؛ زیان بە کەسێک گەیاندن.

**خاک کردن:** *[گفتاری]* ١. نیان؛ ناشتن؛ چاڵ کردن؛ کەردەی چێروو خاکیەوە ‹ببر توی باغچه خاکش کن: ببیە لە ناو باغچەکەدا بینە› ٢. *[ورزش]* لە زەوی دان (لە زۆرەبانێدا) ‹در دو دقیقه حریف را خاک کرد: لە دوو دەقەدا حەریفی لە زەوی دا›.

**خاک گرفتن:** تۆز نیشتن؛ خاک‌وخۆڵ گرتن؛ تەپ و تۆز لێ نیشتن؛ خاک و خۆڵ جێگاییێک داپۆشان ‹روی آینه را خاک گرفته بود: سەر ئاوێنەکە تۆز نیشتبوو›.

**خاک مرده پاشیدن:** *[کنایی]* خاکی مردوو پژان؛ کوندەبەبوو هێلانە کردن؛ پەپوو خوێندن؛ نەبوونی جم و جووڵی ژیان لە شوێنێکدا ‹انگار توی شهر خاک مرده پاشیده بودند: گاوا بە سەر شاردا خاکی مردوو پژاوە›.

**با خاک یکسان کردن:** *[مجازی]* تەخت کردن؛ خاپوورکردن؛ کاول‌کردن؛ وێران‌کردن.

**به خاک افتادن:** *[کنایی]* ١. زەبوون بوون؛ زار بوون؛ زەلیل بوون ‹دشمن به خاک افتاد: دوژمن زەبوون بوو› ٢. مل‌کەچ وێستان؛ سەر دانەواندن؛ کەوتنە سەر دەست و پێ ‹همه در برابرش به خاک افتادند: هەموو لە بەرامبەریەوە مل‌کەچ ویستان›.

**به خاک افکندن:** *[کنایی]* زەبوون‌کردن؛ شکست دان.

**به خاک سپردن:** *[کنایی]* ناشتن؛ ئەسپەردە کردن؛ نێژان؛ نیان؛ نیەی؛ سراونەی؛ مردوو نانە ناو گۆڕەوە و بە بەرد و گڵ داپۆشینی ‹او را در جای امنی به خاک سپردند: لە جێگایەکی بێ‌مەترسیدا ناشتیان›.

**به خاک سیاه نشاندن:** *[کنایی]* نانە قوڕ؛ قوڕەماوکردن؛ هەرگ کردنە سەرا؛ هەڕکەردەی سەرەرە؛ ئاو کردنە ژێرماڵ؛ بێ‌دەست‌وپێ‌کردن ‹جنگ ما را به خاک سیاه نشاند: شەڕ ئێمەی نایە قور›.

**به خاک و خون کشیدن:** *[کنایی]* داپاچین؛ کوشت‌وبڕ/ قەڵت‌وبڕکردن.

**خـــاک‌آلـــود** / xākālûd/: صـفت. خــۆڵاوی؛ خاکاوی؛ تــۆزاوی ‹لباسش خاک‌آلود بـود: جـل و بەرگەکەی خۆڵاوی بـوو›. هـەروەها: **خـاک‌آلـود بودن؛ خاک‌آلود شدن؛ خاک‌آلود کردن**

**خـــاک‌اره** / xākarre/: اسـم. بـڕە؛ خاکەهــەڕە؛ کرکــڕ؛ خاکەمــشار؛ شاردەمــشار؛ وردەمــشار؛ ئاردەمشار؛ خاکەی وەبەرهاتوو لە بڕینی دار.

**خاک‌انداز** / xākandāz ، ـها/: اسـم. مـستینک؛ مەسـە؛ مەسـیێ؛ ئەسـتیو؛ مەدوونـە؛ مەدونـە؛ مەدوز؛ هـستیفک؛ خاکنـاز؛ خاکـەناز؛ کـف‌گـو؛ کەرەسەیەک بە لێوارەیەکی باریک و ڕوویـەکی تەختــەوە، بــۆ هەڵــگرتنی خـــاک، خـــۆڵ و خۆڵەمێش.

**خاکاهــک** / xākāhak/: اسـم. [زمـین‌شناسـی] گلەحەرام؛ خاکی قسڵ؛ خاکی دەشـتی قاقـڕ و وشک کە ڕێژەیەکی زۆر لە ماکی قسڵی تێدایە.

**خاکاهن** / xākāhan/: اسم. خاک‌ئاسـن؛ خـاکی سەرزەوینی شۆدار کە لە هەموو جۆر پێکهاتـەی ئالومنیۆم و ئاسن پەستواوە.

**خاکبازی** / xākbāzî/: اسم. خـاپۆرە؛ خاکبـازی: ۱. خاپتانـێ؛ خۆڵـەپەتانێ؛ خۆڵـەپۆتێ؛ کـار و ڕەوتی کایـــەکردن بـــە خـــۆڵ ۲. [تعـــریض] قوڕەکاری؛ هەڕەکاری؛ کردوکۆشی خانووسـازی ‹اسم این خاکبازی را گذاشته خانه‌سازی: نـاوی ئـەم قوڕەکاریەی ناوە ماڵ کردنەوە›.

**خـــاکبرداری** / xākbardārî ، ـهـــا/: اســم. خاک‌هەڵـگری؛ خـاک‌هەڵـکەنی؛ کـار و ڕەوتی گۆزتنـەوەی خـاک لـە شـوێنێ، بەتایبـەت بـۆ کردوکۆشی ساختومانی. بەرانبەر: **خاکریزی**

**خاکــدان** / xākdān/: اسـم. ۱. خوەڵـەکەوان؛ خۆڵەکەوە؛ خەلەکەوان؛ جێ خڕبوونەوەی خـۆڵ و خۆڵەمێش ۲. [کنایی، ادبی] دنیـا؛ سـەرزەوی؛ ژینگەی مرۆ.

**خاکروب** / xākrûb/: اسم. [ادبی] سپوور؛ کەناس؛ پاکڤان؛ گەسکدەری دەر و کۆڵانان.

**خاکروبه** / xākrûbe ، ـها/: اسـم. ۱. خاکـەماڵ؛ تـەپوتـۆز؛ خـاک و خۆڵـێ کـە لـە ڕاماڵـینی شوێنێک کۆ دەبێتەوە ۲. زبڵ؛ کرس؛ شـەخەڵ؛ زوێڵ؛ خاشاڵ؛ خەوش‌وخاڵ؛ زبڵ‌وزاڵ.

**خـاکریز** / xākrîz ، ـهـا/: اسـم. لەنـد؛ قوتکـە؛ خاکرێژ؛ تەپۆلکە؛ زەوینی قوتکە؛ زەوی بەگەوە، بەتایبەت گردۆڵەی دەسکردی دوو لای ڕووبـار، ئاوەڕۆ یان چاڵێک.

**خاکریزی** / xākrîzî ، ـها/: اسم. خاکـرێژی؛ کـار یان ڕەوتی گڵ ڕشـتن؛ سـەتماندن؛ ڕەدمانـدن؛ قولکە پڕکردنەوە بە خاک و پتر بۆ کـار و بـاری خانووسازی. بەرانبەر: **خاکبرداری**

**خـاکزی** / xākzî ، ـهـا؛ ـان/: صـفت. خـاکژی؛ گلژی؛ بە تایبەتمەندی یان گرۆ بوون بە ژیان لە ناو خاکدا.

**خاکـساری** / xāksārî/: اسـم. خاکەسـاری؛ خـۆ شـکاندنەوەی لـە ئەنـدازە بـەدەر. هـەروەها: **خاکسار**

**خاکـسپاری** / xāksepārî/: اسـم. کـار و ڕەوتی ئەسپەردەکردن؛ ناشتن؛ سراونەی؛ نیان؛ نێـژان؛ بە خاک سپاردن ‹عدەی زیادی در خاکسپاری استاد حضور داشتند: تـاقمێکی زۆر بـۆ ئەسـپەردە کـردنی مامۆستا هاتبوون›.

**خاکستر** / xākestar ، ـها/: اسـم. ۱. خۆڵـەمێش؛ خۆڵەمــشکی؛ مــشکی؛ خۆڵــەمرە؛ خۆڵــەمڕ؛ خۆڵـەکەوە؛ خوەڵـەکەوو؛ خۆڵـیپـڤک؛ بـووڵ؛ بووڵە؛ بۆڵە؛ بوور؛ بووڕ؛ پەلەمور؛ خۆلی؛ خوەلی؛ تۆزینە؛ مۆر؛ خاکـری؛ خاکەری؛ خاکسەر؛ قـل؛ بێلەکۆ؛ ئـاری؛ باپوسـکە/ بابوسـکە (بـۆ کاغـەز)؛ سوتوو/سۆتک/ سووتک(بۆ نان و جگەرە)؛ ماکێکی نـەرمی وردیلـە کـە لـە سـووتانی شـتێک دەمێنێتــەوە ۲. گەردیلــەی کانگــەیی لــە دەرگانەی گڕکاندا.

**خاکسترنشین** / xākestarnešîn/: صفت. [مجـازی] هەژار؛ نـەدار؛ بەڵـەنگاز؛ ڕەش و ڕووت؛ بێچـارە؛

خاک‌نشین. هەروەها: **خاکسترنشینی**

**خاکستری**[1] / xākestarî/: اسم. خۆڵەمێشی؛ گورگی؛ گەورەک؛ شینکی؛ تاقمە ڕەنگی نێوان سپی و ڕەش. هەروەها: **خاکستری رنگ؛ خاکستری فام**

**خاکستری**[2]: صفت. ١. بووڵین؛ خۆڵەمێشی؛ بە ڕەنگی خۆڵەمێش ‹موی خاکستری: قژی خۆڵەمێشی› ٢. بووڵاوی؛ خۆڵاوی؛ ئاڵاو بە خۆڵەمێشەوە ‹با سر و صورت خاکستری برگشت: بە دەم و چاوی خۆڵاویەوە گەڕاوە›.

**خاک‌شناسی** / xākšenāsî/: اسم. خاکناسی؛ ئاخناسی؛ خەرپناسی؛ زانستی ورد بوونەوە و وەرد دانەوەی خاک و سەرچاوگە و تایبەتمەندیەکانی. هەروەها: **خاک‌شناس**

**خاکشویی** / xākšûyî/ ☜ **آبشویی**

**خاکشی** / xākšî/ ☜ **خاکشیر-٢**

**خاکشیر** / xākšîr، ـها/: اسم. شیوەران؛ خاکشیر؛ خۆڵوشیر؛ خوەڵەشێرە؛ خاشیرە: ١. گیایەکی یەکساڵانە تایبەتی ناوچەی کەمئاو، بە گەڵای برگە-برگەی زۆر و گوڵی زەرد و ڕۆشن و تۆمی وردەوە ٢. بەری وردی ئەو گیایە کە بۆ دەرمان باشە: **خاکشی** *[گفتاری]*

**خاکشیرمزاج** / xākšîrmezāc, -mazāc، ـها/: [فارسی/عربی] صفت. ١. خۆساز؛ کەوی؛ ڕاهاتوو؛ خاوەن توانستی خۆ گونجاندن لەگەڵ هەمووجۆرە بار و دۆخێکدا ٢. *[مجازی]* لوسکەباز؛ مناڵباز؛ بەچەباز؛ نێرباز.

**خاک‌وخل** / xāk-o-xol/: اسم. *[گفتاری]* خاک و خۆڵ؛ خاک و خولە؛ تەپ و تۆز؛ خۆڵ و تۆز و خۆڵەمێشی کۆوەبووی سەرزەوی ‹بچەها توی خاک و خل بازی می‌کردند: منداڵەکان لە ناو خاک و خۆڵدا کایەیان دەکرد›.

**خاک‌وخلی** / xāk-o-xolî/: صفت. خۆڵاوی؛ خۆڵینە؛ تۆزاوی؛ خاک‌وخۆڵی ‹با همان لباس خاک و خلی پشت میز نشست: هەر بەو جل و بەرگە خۆڵاویە لە پشت مێزەوە دانیشت›.

**خاکه** / xāke، ـها/: اسم. وردە؛ تۆزە؛ خاکە؛ ماکێکی نەگۆڕ کە بە هۆی سوانەوە بووەتە گەردیلە ‹خاکەقند: وردەقەند›.

**خاکی** / xākî/: صفت. خاکی: ١. بۆر؛ بە ڕەنگی قاوەیی ڕۆشنی ئاماڵ زەرد. هەروەها: **خاکی‌رنگ** ٢. گڵی؛ خاکی؛ لە خاک؛ خروتی؛ لە جنسی خاک ‹تپەی خاکی: گردی خاکی› ٣. سەر بە گۆی زەوین ‹انسان خاکی: مرۆی خاکی› ٤. سەر بە وشکانی ‹عملیات آبی-خاکی: چالاکی ئاوی-خاکی› ٥. گیرۆ یان پێوەندیدار بە خاکەوە ‹کرم خاکی: کرمی خاکی› ٦. خۆڵاوی؛ خاکاوی ‹پیراهنم خاکی شد: کراسەکەم خۆڵاوی بوو› ٧. *[کنایی، گفتاری]* خاکەسار؛ بێ‌دەعیە و دەمار؛ بێ‌فیز؛ بێ‌هەوا ‹آدم خاکی: مرۆی خاکەسار›.

**خاگ** / xāg، ـها/: اسم. *[زیست‌شناسی]* باتۆ؛ خایە؛ خا؛ هێک؛ هێلکەگون.

**خاگ - تخمدان** / xāgtoxmdān/ ☜ **تخمدان-بیضه**

**خاگ‌جامه** / xāgcāme/: اسم. *[کالبدشناسی]* هەویج؛ ڕتل؛ توورەکەی گون؛ پێستێ کە هیلکەگونی تێدایە: **خاگدان**

**خاگدان** / xāgdān/ ☜ **خاگ‌جامه**

**خاگینه** / xāgîne/: اسم. خاریز؛ خایینە؛ خاوروزن؛ خۆراکێکە لە ئارد و هێلکە کە بەش-بەش دەرۆندا سووری دەکەنەوە و دوایی شەربەت یان دۆشاوی بە سەردا دەکەن.

**خال** / xāl/: [عربی] اسم. خاڵ: ١. /ـها/ تووتە؛ نیشان؛ نیشانە؛ نیشانێ؛ لەکم؛ خاڵە؛ نتک؛ نچک؛ تانە؛ نوختە یان نیشانەی ڕەشی چکۆلە لە سەر پێستی لەش ‹خال لب: خاڵی لێو› ٢. /ـها/ پەڵە؛ پنک؛ پڵک؛ نیشانە یان نوختەی گەورە لە سەر قاقەز، پارچە و... ‹خال ورق: خاڵی وەرەق› ٣. *[ادبی]* لالۆ؛ لالە؛ خاڵۆ؛ هاڵۆ؛ خاڵ؛ خاڵە؛ برای دایک.

◙ **خال جوش** ☜ **خال‌جوش**

**خال گوشتی:** لک؛ قنچکه؛ لکی گۆشتی؛ زیاده گۆشت؛ قوتکه‌ی گۆشتینی چکۆله و بۆر له سه‌ر پێست.

◘ **خال (به چیزی) نیفتادن:** ڕووش تێنه‌که‌وتن؛ ڕیش نه‌بوون؛ کرِ پێ نه‌هاتن ‹هنوز یک خال به این یخچال نیفتاده: ئه‌م یه‌خچاله هێشتا ڕووشێکی تێ نه‌که‌وتووه›.

**خال کوبیدن:** خاڵ‌کوتان؛ کوتانی خاڵ له سه‌ر پێست.

**خال‌جوش** / xālcûš ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. خاڵجۆش؛ خاڵێکی چکۆله‌ی جۆشکاری.

**خال‌ــخال** / xālxāl ، ـها/: [عربی] صفت. خاڵ-خاڵ؛ چیل‌ــچیل؛ خاڵدار؛ خالاوی؛ به خاڵی زۆره‌وه ‹دیوار از لکه‌های جوهر، خال-خال شده بود: دیواره‌که له په‌ڵه‌ی جه‌وهه‌ر، خاڵ-خاڵ ببوو›.

**خال‌ــخالی** / xālxālî/: [عربی] صفت. خاڵ‌خاڵۆکه؛ خاڵخاڵۆک؛ خاڵ-خاڵی؛ خاڵماوی؛ چێڵ؛ نه‌خشاو به خاڵی جۆراوجۆر له په‌نای یه‌کتره‌وه ‹گربه‌ی خال-خالی: پشیله‌ی خاڵخاڵۆکه›.

**خالص** / xāles/: [عربی] صفت. ۱. بێ خه‌وش؛ بێ گه‌رد؛ پاک؛ فه‌تات؛ ڕه‌سه‌ن؛ بێ خڵت؛ بێ‌تێکه‌لاوی له‌گه‌ڵ شتێکی‌تردا ‹نژاد خالص: ڕه‌گه‌زی ڕه‌سه‌ن› ۲. سافی؛ ساف؛ په‌تی؛ ڕووت؛ بێ‌ده‌فر ‹وزن خالص: وه‌زنی سافی› ۳. *[مجازی]* پاک؛ بێ‌خه‌وش؛ بێ‌گه‌رد؛ بێ گرێ‌وگۆڵ؛ پاقژ؛ په‌تی ‹دوستی خالص: دۆستایه‌تی پاک›.

**خالصاًمخلصاً** / xālesanmoxlesan/: [عربی] قید. بێ گرێ‌وگۆڵ؛ به ڕووڕاستیه‌وه؛ ڕاست و پاک ‹خالصاًمخلصاً همه چیزش را در اختیار ما گذاشت: بێ گرێ‌وگۆڵ هه‌موو شتێکی خسته به‌ر ده‌ستمانه‌وه›.

**خالصانه**[1] / xālesāne/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕاست و پاک؛ بێ پێچ‌وپا؛ بێ‌خه‌وش؛ بێ گه‌رد ‹سلام خالصانه: سلاوی ڕاست و پاک›.

**خالصانه**[2]: قید. ڕاست و پاک؛ به بێ پێچ‌وپا ‹هنوز خالصانه کار می‌کند: هێشتا ڕاست و پاک کار ده‌کا›.

**خالصجات** / xālescāt/: (!) [عربی] جمعِ ☜ **خالصه**

**خالصه** / xālese ، خالِصجات/: [عربی]/اسم. زه‌ویین یان کێڵگه‌ی سه‌ر به ده‌وڵه‌ت.

**خالق** / xāleq/: [عربی]/اسم. ۱. /ـان؛ ـین/ داهێنه‌ر؛ قه‌دان‌ده‌ر ‹خالق فیلمهای سینمایی بود: داهێنه‌ری فیلمی سینه‌مایی بوو› ۲. ئافرێنه‌ر؛ خولقێنه‌ر؛ به‌دیهێنه‌ر ‹خالق یکتا: ئافرێنه‌ری تاک›.

**خالکوبی** / xālkûbî/: [عربی/ فارسی]/اسم. خاڵکوت: ۱. /ـها/ نه‌خش و نیگار یان نووسراوه و وێنه که به ده‌رزی‌ئاژن کردنی پێست به‌دی‌دێ ۲. کار و ڕه‌وتی خاڵ‌کوتان؛ ده‌قان؛ ده‌قاندن؛ کوتانی خاڵ له سه‌ر پێست ‹خالکوبی کردن: خالکوت کردن›.

**خالو** / xālû ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. خاڵ؛ خال؛ خاله؛ خالۆ؛ لاله؛ لالۆ؛ برای دایک.

**خاله** / xāle ، ـها/: [عربی]/اسم. پوور؛ یایک؛ یای؛ میم؛ میمک؛ میمگ؛ میمی؛ بتی؛ مه‌تی؛ خاماجی؛ هاله؛ دیگه؛ خالتێک؛ پلک؛ خوشکی دایک.

**خاله‌بازی** / xālebāzî/: [عربی/ فارسی]/اسم. ۱. *[گفتاری]* زمانبازی درۆیین؛ خۆش ویستنی درۆیی و ناڕاست ۲. ماڵ‌ــماڵ؛ ماڵ‌ماڵێنێ؛ کایه‌ی منالان، به‌تایبه‌ت کچان، به شێوه‌ی لاسایی کردنه‌وه‌ی ئاکاری گه‌وره‌کان (وه‌ک میوانی، زه‌ماوه‌ن و...).

**خاله‌بی‌بی** / xālebîbî/: [عربی/ ترکی]/اسم. ئارده‌وا؛ په‌ڵووله؛ چێشتی گزمووله هه‌ویر و کووزه‌له.

**خاله‌خانباجی** / xālexāmbācî, -xānbācî ، ـها/: [عربی/ ترکی]/اسم. *[گفتاری]* ده‌سه‌خوشک؛ ده‌سه‌والێ؛ ژنانی هاواڵ و هاوده‌م به‌تایبه‌ت ژنانی ڕه‌مه‌کی ‹هر روز خانه‌ی یکی از خاله‌خانباجی‌ها جمع می‌شدند و گپ می‌زدند: هه‌ر ڕۆژێک له ماڵی

دەسەخوشکێکدا کۆ دەبوونەوە ودەمەتەقێیان بوو›.

**خاله خرسه** / xālexerse/: [عربی/ فارسی]/اسم. [گفتاری] ١. قارەمانی بڕێک لە چیرۆکانی ئێرانی ٢. [کنایی] دۆستی نەفام.

**خاله‌رو رو** / xālerowrow/: [عربی/ فارسی]/اسم. [کنایی] دەرگێڵ؛ ماڵەوماڵکەر؛ گەڕاڵ؛ ماڵانگەڕ؛ ژنێ کە لە پەستا ئەم لا و ئەلا دەکاو بە ماڵی خۆیدا ناگا.

**خاله‌زاده** / xālezāde ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پوورزا؛ مەتیەزا؛ میمکەزاگ؛ میمزا؛ پایکزا؛ هالەزا؛ پوورزای دایکی؛ ڕۆڵەی خوشکی دایک.

**خاله‌زنک** / xālezanak ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. [مجازی] ژنەڕەنگە؛ کەسێ کە بە ئاکار و گوتاری دزێو، هۆگری خراپەبێژی و شۆفاری و شۆپگری بابەتی بێنرخە ‹مرد نباید این طور خاله‌زنک باشد: پیاو نابێ ئاوا ژنەڕەنگە بێ›.

**خاله‌سوسکه** / xālesûske, -sûsge/: [عربی/ فارسی]/اسم. [گفتاری] ١. قارەمانی بڕێ چیرۆکی کۆن ٢. [مجازی] ژیرۆکە؛ مرۆی وردیلەی بەمشوور.

**خالی** / xālî/: [عربی] صفت. خاڵی؛ هاڵی: ١. /ـها/ بەتاڵ؛ بەوش؛ پەتی؛ چۆڵ؛ والا؛ واق؛ هویل؛ خوت؛ وەلا؛ ڤالا؛ هەوێلا؛ خوت و خاڵی؛ خت و خاڵی؛ خرت و خاڵی؛ بە بۆشاییێک کە شتێکی تێدا نیە ‹اتاق خالی: ژووری خاڵی› ٢. /ـها/ نەگێردراو؛ نەگیراو؛ بەتاڵ ‹صندلی خالی: کورسی خاڵی› ٣. ڕووت؛ ڕووتی؛ پەتی؛ تەنیا؛ تەنێ؛ بێ شتێکی دیکە ‹نان خالی: نانی ڕووت›.

▣ **خالی بستن:** [گفتاری] ١. بافیش کردن؛ هووشەکردن؛ خۆ هەڵکێشان ‹او مرد این کارها نیست، خالی می‌بندد: ئەو پیاوی ئەم کارانە نیە، بافیش دەکا› ٢. درۆکردن؛ فشەکردن؛ دەلەسەکردن؛ درۆ دان؛ درۆێ دای ‹خالی می‌بست: درۆی دەکرد›.

**خالی شدن:** چۆڵ بوون؛ بەتاڵ بوون؛ خاڵی بوون؛ خوت بوون ‹خانه خالی شد: ماڵەکە چۆڵ بوو›. هەروەها: **خالی بودن؛ خالی کردن**

**خالی گذاشتن:** بەتاڵ هێشتنەوە؛ خاڵی و والا هێشتنەوە؛ هاڵی و هەوێلا ئاسەیوە ‹مدت دو ماه است خانه را خالی گذاشته: ماوەی دوومانگە خانووەکەی بەتاڵ هێشتووەتەوە›.

**خالی‌الذهن** / xālîyozzehn/: [عربی] صفت. بێ‌ئاگا؛ بێ خەبەر؛ بەبێ ئاگایی پێشوو ‹من به کلی خالی‌الذهن بودم و نمی‌دانستم راجع به چه حرف می‌زنند: من تەواو بێ‌ئاگا بووم و نەمدەزانی لە مەڕ چیەوە قسە دەکەن›.

**خالی السکنه** / xālîyossakane/: [عربی] صفت. چۆڵ و هۆڵ؛ خاڵی و پەتی؛ هاڵی و هەوێلا؛ تایبەتمەندی شوێنێک کە کەسی تێدا ناژیت.

**خالی‌بند** / xālîband ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. [گفتاری] ١. هووشەکەر؛ خۆهەڵکێش؛ بافیش‌کەر ٢. درۆزن؛ فشەکەر؛ گفەدەر.

**خالی‌بندی** / xālîbandî/: [عربی/ فارسی]/اسم. [گفتاری] ١. کار یان ڕەوتی هووشە کردن؛ بافیش کردن ٢. درۆزنی؛ فشەکەری؛ گفەدەری ٣. درۆ؛ فشە؛ درۆێ؛ دەلەسە ‹این حرفها همه خالی‌بندی است: ئەم قسانە هەموو درۆن›.

**خام** / xām ، ـها/: صفت. ١. نەکولاو؛ ناپوخت؛ نەکەلاندی؛ نەگریا؛ خام؛ خاڤ ‹گوشت خام: گۆشتی نەکولاو› ٢. [ادبی] کاڵ؛ خاو؛ خاگ؛ نەگەیشتوو؛ نەگەییو؛ نەیاوا؛ کرچ و کاڵ ‹میوه‌ی خام: میوەی کاڵ› ٣. [مجازی] کاڵ؛ کاربلاو؛ خام؛ کرچ و کاڵ؛ بێ‌ئەزموون ‹آدم خام: مرۆی کاڵ› ٤. خام؛ خاو؛ خاڤ؛ کژ؛ بە شێوەی ماکی سەرەتایی کە کاری لە سەر نەکراوە ‹ابریشم خام: هەورێشمی خام› ٥. [مجازی] خاو؛ بێهوودە؛ بێ‌هۆ؛ بەتاڵ ‹خیال خام: خەیاڵی خاو› ٦. خام؛ گنجی چەرمی.

▣ **خام شدن:** [مجازی] خاپان؛ فریو خواردن؛ گۆڵ واردەی؛ کڵاو چوونە سەر ‹مرا بگو که خام

شدم و پول را دادم دست تو!: چاو له من چۆن خاپام و پاره‌کەم دایه دەستی تۆ؟!›.

**خام کردن**: *[مجازی]* فریـودان؛ خاپانـدن؛ کەرکردن؛ لاباندن؛ گۆڵ دەی؛ خافلاندن ‹تو من را خام کردی: تۆ منت فریو دا›.

**خام‌اندیش** / xāmandîš ، ـها؛ ـان/: *صفت. [مجازی]* بیربەتاڵ؛ بیرخاو؛ کاڵ.

**خامخوار** / xāmxār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* کاڵخۆر؛ خامخۆر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە شتی کاڵ (وەک سەوزی و میوە) دەخوا.

**خامخواری** / xāmxārî/: *صفت.* کاڵخۆری؛ خامخۆری؛ کار و ڕەوتی خواردنی خواردەمەنی بە شێوەی نەکولاو، بەتایبەت سەبزی و میوە و دانەوێڵە.

**خامدست** / xāmdast/: *صفت. [مجازی، ادبی]* ١. لێنەهاتوو؛ کاربلاو؛ ناپوخت؛ ناشارەزا؛ پێنەگەیشتوو؛ دەستەوسان؛ ناشی. بەرانبەر: **چیره‌دست** ٢. تازەکار؛ ناشی؛ دەستخاو.

**خامدستی** / xāmdastî/: *اسم. [مجازی، ادبی]* ١. کاربلاوی؛ ناپوختی؛ دەستەوسانی؛ لێنەهاتوویی؛ ساویلکەیی ٢. تازەکاری؛ دەستخاوی؛ چۆناوچۆنی تازەکار و ناشی بوون.

**خام‌رفتار** / xāmraftār/: *صفت. [مجازی]* ناپوختکار؛ ناپوخت؛ ئاکار کرچ و کاڵ؛ خاوەن کردەوەی ناشیانە.

**خام‌رفتاری** / xāmraftārî/: *اسم. [مجازی]* ناپوختکاری؛ ئاکار ناپوختی؛ ئاکاری بەبێ هەڵسەنگاندن و وردبینی.

**خام‌ریش** / xāmrîš ، ـها؛ ـان/: *صفت. [مجازی]* گێل؛ گەلحۆ؛ گەپچار؛ کەمئاوەز؛ تێنەگەیشتوو.

**خامساً** / xāmesan/: [عربی] *قید. [نامتداول]* ١. پێنجەمین؛ لە پلەی پێنجەم؛ قۆناغی پێنجەم ٢. کەڕەتی پێنجەم؛ جاری پێنجەم؛ ڕای پێنجەم؛ گلی پەنجەم.

**خام‌طمع** / xāmtama'/: [عربی] *صفت. [مجازی]* خەیاڵخاو؛ خەیاڵخام؛ خاوەن ئاوات و هەوای پووچەڵ و بێهۆ.

**خاموت** / xāmût/: [روسی] *اسم.* ١. بەرۆک؛ بەرەک؛ نیلە؛ نیر؛ ئەو بەشە لە ئامووری یەکسمان کە وەک نەوارێ بە بەر شانیاندا دێ ٢. *[ساختمان]* ئەو وردە تەلانە کە بۆ ڕاگرتنی ئارماتور بە دەوریاندا ئاڵقە دەکرێن.

**خاموش** / xāmûš/: *صفت.* خامۆش؛ ئامۆش؛ خەمۆش: ١. کوژاوە؛ کوور؛ خەمۆ؛ بێڕووناکی یان تیشک؛ تەحرانی ڕووناکی ‹ستارەی خاموش: ئەستێرەی خامۆش› ٢. کوژاوە؛ تەمرانەدی؛ قەمریای؛ خەمۆ؛ بێئاگر، تین یان تیشکی گەرمایی ‹بخاری خاموش: کوورەی کوژاوە› ٣. *[ادبی]* بێدەنگ؛ ئارام؛ کپ؛ کڕ؛ وس؛ قڕوقپ؛ قڕ؛ بەبێ دەنگ و هەرا؛ بی قسە و متەق؛ هیچ نەوێژ؛ لاڵ و پاڵ؛ بێکش؛ بێهەست و خوست؛ قەرا و قەپ ‹خاموش باش و هیچ مگو: بێدەنگ بە و هیچ مەیژە› ٤. *[مجازی]* مردوو؛ مەردە. هەروەها: **خاموش بودن؛ خاموش شدن؛ خاموش کردن**

**خاموشی** / xāmûšî/: *اسم.* خامۆشی؛ خەمۆشی؛ ئامۆشی: ١. کوژاوی؛ داکوژاوی؛ چۆنیەتی خامۆش بوون ٢. *ـها/ [ادبی]* کڕی؛ بێدەنگی؛ بێهەرایی؛ بێخوستی؛ ماتی؛ ئارامی؛ هیچ نەوێژی ٣. دوخ یان چۆنیەتی نەبوونی کارەبا.

**خامه** / xāme/: *اسم.* ١. خامە؛ چەوری شیر کە بە شێوەی ئاسایی یان بە هۆی کەرەسەی تایبەتەوە لە شیر جوێ دەکرێتەوە ٢. *[مجازی]* سەرتۆ؛ تۆ؛ سەرتوێژ؛ سەرتوێ؛ تۆژی؛ تۆژگ؛ توێژی سەر شیر و ماست ٣. *ـها/ [ادبی]* قەڵەم؛ پێنووس؛ خامە ‹خامە بە دست دارد و می‌نویسد: پێنووسی بە دەستە و دەنووسێ› ٤. خاوە؛ بەنی تەون؛ هریت ‹نخ خامە: بەنی خاوە› ٥. هەورێشمی نەڕێسراو ٦. *[گیاه‌شناسی]* خامە؛ خام؛ بەشێ لە مێینەی گوڵ.

**خامه‌ای** / xāme'î/: *صفت.* ١. خامەدار؛ تۆدار؛

خامـەیی؛ سـەرتوێدار ‹نـان خامـەای: شـیرینی خامەدار› ۲. بە ڕەنگی خامە؛ کرێم.

**خامەدوزی** / xāmedûzî ، ـها/:اسم. گولـدووری بە هاوریشمی خاو.

**خامـەگیـری** / xāmegîrî/:اسم. خامـەگیری؛ کاری گرتنی خامە لە شیر. هەروەها: **خامەگیر**

**خـامی** / xāmî/:اسم. ۱. نـەکولاوی؛ دۆخ یـان چۆنیەتی نەکولاو بوون ۲. کاڵی؛ گاڵی؛ کاڵـەی؛ نەگەیشتووی؛ خاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کـاڵ و کرچ بوون ۳.[مجازی] بـێئـەزموونی؛ دۆخ یـان چۆنیەتی نەزانکار بوون.

**خان** / xān ، ـها/:اسم. ۱.[ادبی] خانوو؛ ماڵ؛ یانە ‹خان رستم: خانووی رۆسەم› ۲. خان؛ کێـڕی نـاو لوولەی چەکی گەرم ‹خان تفنگ: خانـی تفـەنگ› ۳. [ترکی] /خوانین/ خان؛ میرمـەزن؛ بـەگ؛ ئاغـا؛ سان؛ نازناوی دەسەلاتداران و سـەرەک هـۆزان ٤. [ترکی] سەرناوێک بۆ ڕێزلێنان کە پاش نـاوی چکۆلەی پیاوان دێ ‹خسرو خان: خەسـرەو خـان› ٥. ئاغە؛ گەورە؛ گەورەتر ‹خان‌دایی: خاڵۆئاغە›.

**خانبـاجی** / xāmbācî, xānbācî ، ـها/: [ترکـی] اسم.[گفتاری، قدیمی] دادە؛ دادا؛ واڵـێ؛ دێدێ؛ خوشکەگەورە.

**خانخانی** / xānxānî/: [ترکی]/اسم. خان‌خانـەکێ؛ خان و خانکاری؛ ئاژاوە و بـشێوەی کـار و بـاری وڵات بەهۆی ڕقەبەرایەتی ئاغاکانەوە ‹زمان جنگ، دورەی خانخـانی بـود: کـاتی شـەڕ، سـەردەمی خانخانەکێ بوو›.

**خانــدان** / xān(e)dān ، ـهـا/:اسم. جامـاڵ؛ ماڵــەگەورە؛ گـەورەماڵ؛ خانــەدان؛ بـەرەماڵ؛ بنەماڵ؛ ماڵبات؛ سەرجەمی خـاوخێزان (بـاوک، دایک، خوشـک، بـرا، مامـە، پـوور، میمـک، خاڵـۆ و باوکان و منداڵان و هاوسەرەکانیان).

**خانـسالار** / xān(e)dān/:اسم. خـانیخانـان؛ خان‌خانان؛ ئاغەگـەورە؛ گـەورە و سـەردەسـتەی جووتیارانی ناوچەیەک.

**خانقاه** / xān(e)qāh ، ـها/: [معرب از فارسـی]/اسم. تەکیە؛ دەروێشگە؛ خانەقا؛ خانەگا؛ شـوێنی کـۆ بوونـەوەی شـێخ و سـۆفی و دەروێـشان بـۆ بەجێ‌هێنانی ڕێورەسمی ئایینی خۆیان.

**خان کشی** / xānkešî/:اسم.[صنعت] کار و ڕەوتی خان لێدان؛ شوێنارکردنی نـاو لوولـەی چـەکی گەرم.

**خانگاه**/ xānegāh ، ـهـا/:اسم. خانـەقا؛ خانـەگا؛ تەکیە؛ مزگەوت‌ئاسای شێخ و دەروێشان.

**خـانگی** / xānegî/: صفت. ماڵـی؛ نێوماڵـی؛ ماڵــەچەی: ۱. نێـوماڵـی؛ ناوماڵـی؛ خانـەکی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ماڵـەوە ‹کارهـای خـانگی: کاروبـاری نێوماڵـی› ۲. خانــەکی؛ لــە ماڵــدا دروست‌کراو؛ بەرهـەمی مـاڵ ‹نـان خـانگی: نـانی ماڵی› ۳. ڕامە؛ کەوی؛ کەدی؛ بەیدەست؛ لینی؛ لینیە؛ نێوماڵی ‹مرغ خانگی: مریشکی ماڵی›.

**خانم** / xānom ، ـها/: [ترکی]/اسم. ۱. دادە؛ یـای؛ یـا؛ یایـا؛ یایـە؛ خـانم؛ خـاتوون؛ واڵـێ؛ وشـەی ڕێزگرتن بۆ ژن ‹خانم جان! بفرما بنشین: دادە گیان! فەرموو دانیشە› ۲. خـاتوون؛ خوشـکوو؛ هورمـە؛ نەوا؛ ژنی چاک و خاوەن ئاکاری شیاو ‹سارا خیلی خانم است: سارا زۆر خاتوونە› ۳. خێزان؛ هاوسـەر؛ هاوسـەری پیـاو؛ ژن ‹حـال خـانم چطـور اسـت؟: خیزانتان چۆنە؟›.

**خانمان** / xān(e)mān/:اسم. خا و خێزان؛ ماڵ و ماڵبات؛ ماڵ و منداڵ؛ ژەن و یانـە؛ مـاڵ و حـاڵ؛ ژینگە؛ خان و مان: **خانُ و مان**

**خانمان‌برانداز** / xān(e)mānbarandāz/: صفت ماڵوێرانکەر؛ ماڵ شێوێن؛ کاولکەر؛ یانەوێرانکەر؛ لەناوبەر ‹جنگ خانمان‌برانداز: شەڕی ماڵوێرانکەر›.

**خانمانـسوز** / xān(e)mānsûz/: صفت.[کنـایی] سەر و ماڵ سووتێن؛ ماڵوێرانکەر؛ مـاڵشـێوێن؛ کاولکەر؛ لەناوبەر ‹بلای خانمانـسوز: بـەڵای سـەر و ماڵ سووتێن›.

**خـانم‌بـاز** / xānombāz/: [ترکـی/ فارسـی] صفت

خامەیی؛ سەرتوێدار ‹نان خامەای: شیرینی خامەدار› ٢. بە ڕەنگی خامە؛ کرێم.

**خامەدوزی** / xāmedûzî ، ـها/: اسم. گوڵدووری بە هاورێشمی خاو.

**خامەگیری** / xāmegîrî/: اسم. خامەگیری؛ کاری گرتنی خامە لە شیر. هەروەها: **خامەگیر**

**خامی** / xāmî/: اسم. ١. نەکوڵاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەکوڵاو بوون ٢. کاڵی؛ گاڵی؛ کاڵەی؛ نەگەیشتووی؛ خاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کاڵ و کرچ بوون ٣. *[مجازی]* بێئەزموونی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەزانکار بوون.

**خان** / xān ، ـها/: اسم. ١. *[ادبی]* خانوو؛ ماڵ؛ یانە ‹خان رستم: خانووی رۆسەم› ٢. خان؛ کێڕی ناو لوولەی چەکی گەرم ‹خان تفنگ: خانی تفەنگ› ٣. [ترکی] /خوانین/ خان؛ میرمەزن؛ بەگ؛ ئاغا؛ سان؛ نازناوی دەسەڵاتداران و سەرەک هۆزان ٤. [ترکی] سەرناوێک بۆ ڕێزلێنان کە پاش ناوی چکۆلەی پیاوان دێ ‹خسرو خان: خەسرەو خان› ٥. ئاغە؛ گەورە؛ گەورەتر ‹خان‌دایی: خاڵۆئاغە›.

**خانباجی** / xāmbācî, xānbācî ، ـها/: [ترکی] اسم. *[گفتاری، قدیمی]* دادە؛ دادا؛ واڵێ؛ دێدێ؛ خوشکەگەورە.

**خانخانی** / xānxānî/: [ترکی] اسم. خان‌خانەکێ؛ خان و خانکاری؛ ئاژاوە و بشێوەی کار و باری وڵات بەهۆی ڕقەبەرایەتی ئاغاکانەوە ‹زمان جنگ، دورەی خانخانی بود: کاتی شەڕ، سەردەمی خانخانەکێ بوو›.

**خاندان** / xān(e)dān ، ـها/: اسم. جامال؛ ماڵەگەورە؛ گەورەماڵ؛ خانەدان؛ بەرەماڵ؛ بنەماڵ؛ ماڵبات؛ سەرجەمی خاوخێزان (باوک، دایک، خوشک، برا، مامە، پوور، میمک، خاڵۆ و باوکان و منداڵان و هاوسەرەکانیان).

**خانسالار** / xān(e)dān/: اسم. خانی‌خانان؛ خان‌خانان؛ ئاغەگەورە؛ گەورە و سەردەستەی جووتیارانی ناوچەیەک.

**خانقاه** / xān(e)qāh ، ـها/: [معرب از فارسی] اسم. تەکیە؛ دەروێشگە؛ خانەقا؛ خانەگا؛ شوێنی کۆ بوونەوەی شێخ و سۆفی و دەروێشان بۆ بەجێهێنانی ڕێوڕەسمی ئایینی خۆیان.

**خان‌کشی** / xānkešî/: اسم. *[صنعت]* کار و ڕەوتی خان لێدان؛ شوێنارکردنی ناو لوولەی چەکی گەرم.

**خانگاه** / xānegāh ، ـها/: اسم. خانەقا؛ خانەگا؛ تەکیە؛ مزگەوت‌ئاسای شێخ و دەروێشان.

**خانگی** / xānegî/: صفت. ماڵی؛ نێوماڵی؛ ماڵەچەی: ١. نێوماڵی؛ ناوماڵی؛ خانەکی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ماڵەوە ‹کارهای خانگی: کاروباری نێوماڵی› ٢. خانەکی؛ لە ماڵدا دروست‌کراو؛ بەرهەمی ماڵ ‹نان خانگی: نانی ماڵی› ٣. ڕامە؛ کەوی؛ کەدی؛ بەیدەست؛ لینی؛ لینیە؛ نێوماڵی ‹مرغ خانگی: مریشکی ماڵی›.

**خانم** / xānom ، ـها/: [ترکی] اسم. ١. دادە؛ یای؛ یا؛ یایا؛ یایە؛ خانم؛ خاتوون؛ واڵێ؛ وشەی ڕێزگرتن بۆ ژن ‹خانم جان! بفرما بنشین: دادە گیان! فەرموو دانیشە› ٢. خاتوون؛ خوشکوو؛ هورمە؛ نەوا؛ ژنی چاک و خاوەن ئاکاری شیاو ‹سارا خیلی خانم است: سارا زۆر خاتوونە› ٣. خێزان؛ هاوسەر؛ هاوسەری پیاو؛ ژن ‹حال خانم چطور است؟: خێزانتان چۆنە؟›.

**خانمان** / xān(e)mān/: اسم. خا و خێزان؛ ماڵ و ماڵبات؛ ماڵ و منال؛ ژەن و یانە؛ ماڵ و حاڵ؛ ژینگە؛ خان و مان: **خانُ و مان**

**خانمان‌برانداز** / xān(e)mānbarandāz/: صفت. ماڵوێرانکەر؛ ماڵ شێوێن؛ کاولکەر؛ یانەوێرانکەر؛ لەناوبەر ‹جنگ خانمان‌برانداز: شەڕی ماڵوێرانکەر›.

**خانمانسوز** / xān(e)mānsûz/: صفت. *[کنایی]* سەر و ماڵ سووتێن؛ ماڵوێرانکەر؛ ماڵ‌شێوێن؛ کاولکەر؛ لەناوبەر ‹بلای خانمانسوز: بەڵای سەر و ماڵ سووتێن›.

**خانمباز** / xānombāz/: [ترکی/ فارسی] صفت.

[گفتاری] تـۆلاز؛ پـسکه‌باز؛ خـاوەن خـدەی چـاو لەوەڕێنی و ژنبازی.

**خانم‌بازی** / xānombāzî/: [ترکـی/ فارسـی]/اسـم. [گفتاری] تۆلازی؛ ژنبازی؛ پسکەبازی؛ ئەویـنـداری و تێکەڵی لەگەڵ ژنانی جگە لە هاوسەری خۆ.

**خـانم‌بـزرگ** / xānombozorg ، ـهـا/: [ترکـی/ فارسـی]/اسـم. داپـیر؛ داپـیرک؛ داپـیرە؛ ئامـە؛ دایەگەورە؛ ئادە؛ سەرناوێک بۆ ڕێز نـان لـە ژنی بە تەمەنتری بنەماڵە. هەروەها: **خانم‌کوچک**

**خـــانمی** / xānomî/: [ترکـی]/اسـم. خـــاتوونی؛ هورمـــەیی؛ خـــانمی؛ خانمیـــەتی؛ دۆخ یـــان چۆنیـــەتی خـــاتوون بـــوون ‹خـانمی از سـرتاپایش می‌بارید: لە سەر تا پای، خاتوونی دەباری›.

**خانوادگی** / xān(e)vādegî/: صفت. بنەماڵەیی؛ خێزانی ‹رابطەی خانوادگی: پەیوەندی بنەماڵەیی›.

**خـانواده** / xān(e)vāde ، ـهـا/:اسم. بنەمالـە؛ خێـزان: ١. مالـبات؛ خـاوخێر؛ کۆمەلـێک لـە کەسان کە پێکەوە خزمایەتی یان پەیوەندی ژن و ژنخوازیان هەیە ‹یک وقتی خانوادەی او تمام شـهر را در اختیار داشتند: سەردەمێک بنەماڵەکەی، هـەموو شاریان بە دەستەوە بوو› ٢. ژن‌ومناڵ؛ خاوخێزان؛ ژن و زاڕۆ؛ ئاتئەیاڵ؛ کۆمەلـێ کەسـان کـە بـە خزمایەتی لە خانووێکدا دەژیـن و یانـەوانێکیان هەیە ‹پس از مرگ پدر، برادر بزرگتر رییس خانواده شد: پاش مردنی باب، برای گـەورەتر بـوو بـە سـەرۆکی خێزان› ٣. کۆمەڵەی خزم و کەسـانی کەسـێک (بەتایبـەت خزمانی پلـەی یـەک) ‹فقـط خـانوادەاش اجازەی ملاقـات داشـتند: تـەنیا بنەماڵـەکەی بـەرایی چاوپێکـەوتنیان هـەبوو› ٤. [زیسـت‌شناسـی] تـیرە؛ خێڵ ٥. تـیرە؛ دەسـتە؛ کۆمەلـەی شـتانێ کـە پەیوەندیەکی هاوبەشیان هەیـە، یـان لـە یـەک بنەچە و بناوانن ‹خانوادەی زبانهای هندو ـ اروپـایی: تیرەی زمانانی هێندو- ئورووپایی›.

**خانوار** / xān(e)vār ، ـها/:اسم. خانەوار؛ بنەماڵە؛ خێزان؛ یانەسا؛ یەکەی کۆمەلایـەتی و ئـابووری کە پێکەوە و بە سەرپەرشتی کەسێک دەژیـن و لە کار و بژیوی ڕۆژانەدا هاوبەشن ‹خـانوار ممکـن است یک نفره و یا بیشتر باشد: بنەماڵـە ڕەنگـە یـەک کەسی یان زۆرتر بێ›.

**خان‌ومان** / xān-o-mān/ ☜ **خانمان**

**خانـه**[1] / xāne ، ـهـا/:اسـم. مـاڵ؛ یانـە؛ خانـە: ١. خانوو؛ یـانی؛ خانـک؛ خانـگ؛ خـانی؛ کـێ؛ کەی؛ کەل؛ مار؛ کیە؛ جێگەی نیشتەجێ بـوون و ژیـان و حەسـانەوە ‹امشب در خانـەی مـا بمـان: ئەمـشەو لـە مالـی ئێمـەدا بمێنـەوە› ٢. خـانوو؛ دەمانـە؛ هوونـە؛ خانووبـەرە؛ بینایێـک کـە بـۆ نیشتەجێ بوون چێ‌کـراوە ‹ایـن خانـه بـه فـروش مـی‌رسـد: ئـەم مالـە دەفرۆشـرێت› ٣. خـانوو؛ خانووبەرەی جگە لە وارخان و زۆرتر بە حەوشـە و حەسارەوە ‹خرید و فروش خانه و آپارتمان: سەندن و فرۆشـتنی مـال و وارخـان› ٤. خـان؛ کـەلی؛ چەن گۆشە (چوار، پێـنج، شـەش،... گۆشـە) لـە پەڕەیێکـدا ‹خانـەی شـطرنج: مالـی شـەترەنج› ٥. جێگە؛ شوێن؛ چاوەیەک لە پێکهاتەیێکدا کە جێـی شـتێکە ‹خانـەی زیـن: جێگـەی زیـن› ٦. [گیاەشناسی] چاوەی نێو هێلکۆکـە یـان میـوە ٧. [مجـازی] ماڵ؛ ماڵۆ؛ ئەندامانی بنەمالـە بـەبێ دیاری‌کردن ‹به خانه سپردەام پول را بدهند به تو: بـە مالـەوەم ڕاسـپاردووە پارەکـەت پـێ بـدەن› ٨. ناوەندێ کـە بـۆ کـارێکی تایبـەتی تـەرخان کرابێ ‹خانەی بهداشت: یانەی تەندروستی›.

▣ **خانەی آخرت**: [کنایی] دوا هەوار؛ گلکۆ؛ گـۆڕ؛ قەبر؛ قەور؛ زیارەت.

**خانـەی اربـابی**: مالـی ئاغـا؛ مالـە ئاغـا؛ خانووبەرەیەک کە بۆ جێ ژیانی خـان چـێ کراوە.

**خانەی بخت**: [کنایی] مالی شـوو؛ مالـە مێـرد؛ یانەو شووی.

**خانەی بهداشت**: یانـەی تەندروسـتی؛ یانـەی لەش‌ساغی؛ دامەزراوەیەک کە لە گوندێکدا بۆ

هەڵسووڕانی کار و باری دەوا و دەرمانی ئاسایی خەڵک، لە لایەن کەسانێکەوە کە لە ماوەیەکی کورتدا ڕاهاتوون بەڕێوە دەچێت.
**خانەی تیمی:** یانەی دەستەیی؛ ماڵێک کە ئەندامانی تاقم، بەتایبەت دامەزراوەیەک بە گشتی تێیدا دەژین.
**خانەی خدا:** ١. قیبلەگا؛ کەعبە؛ ڕووگە ٢. مزگەوت؛ مزگت؛ مزگی؛ مزگەفت؛ مزفت.
**خانەی زین:** ڕۆنیشتگە؛ جێگەی زین؛ جێی دانیشتن بە سەر زینەوە.
**خانەی سازمانی:** ماڵێ کە لە لایەن دامەزراوەیەکەوە بۆ نیشتەجێ بوونی ئەندامانی ئەو دامەزراوەیە دابین کراوە.
**خانەی سالمندان** ☜ سرای سالمندان، **سرا**
**خانەی شطرنج:** خانەی شەترەنج؛ خانۆکەی شەترەنج؛ هەر کام لە چوار گۆشە ڕەش و سپیەکانی پەڕەی شەترەنج.
**خانەی ویلایی:** خانوو؛ ماڵ؛ خانگ؛ ماڵێک بە حەوشەو حەسارەوە، بە شێوەی ماڵێ سەربەخۆ.
▣ **بە خانەی بخت رفتن:** *[کنایی]* چوونە ماڵی خۆ؛ شووکردن ‹دو ماه دیگر تو هم بە خانەی بخت می‌روی: دوومانگی دی تۆیش دەچیە ماڵی خۆ›.
**خانە کردن:** *[مجازی]* مانەوە؛ نیشتەجێ بوون ‹مدتی در چادر خانە کردند: ماوەیەک لە خێوەت مانەوە›.
**ـخانە**[2]**:** *پیوازە.* ـخانە؛ جێگەی جێبەجێ کردنی کارێ یان دامەزرانی شتێ ‹قهوەخانە: قاوەخانە›.
**خانەبدوش** / xānebedûš ، ـها؛ ـان/: *صفت.* ماڵ بەکۆڵ؛ ماڵ بەشان؛ ماڵ لە سەر شان؛ هەڵوەدا؛ عەودال؛ عەبدال؛ ڕەهندە؛ لانەواز؛ ڕیتاڵ؛ ڕەبەن؛ بێ‌ماڵ و حاڵ ‹بعد از فروش خانە، مدتی خانەبدوش بودیم: لە دوای فرۆشتنی ماڵەکە، ماوەیەک ماڵ بە کۆڵ بووین›: هەروەها: **خانەبدوشی**
**خانەبیزار** / xānebîzār/: *صفت.* لانەبێز؛ خانەبێز؛ خانەبێزار؛ ماڵ تەریوو؛ وەڕەز و دوورەپەرێز لە ماڵ.
**خانەتکانی** / xānetakānî, -tekānî ، ـها/: *اسم.* گەردیلە؛ ماڵ پاک‌کردنەوە؛ کار یان ڕەوتی خاوێن‌کردنەوەی ماڵ و کەل‌وپەلی ناوماڵ.
**خانەـخانە** / xānexāne/: *صفت.* ماڵـ ماڵ؛ خانەـخانە؛ کەلـکەلی: ١. شەترەنجی؛ بە نەخشی چەند لای ڕێک‌وپێک ‹پیراهنش خانەـخانە بود: کراسەکەی شەترەنجی بوو› ٢. بە چاوەچوی زۆرەوە ‹توی چاپخانە میزهای خانەـخانە هست کە حروف را توی آنها می‌ریزند: لە چاپخانەدا مێزی ماڵـ ماڵ هەیە کە پیتی تێدەڕێژن›.
**خانەخراب** / xānexarāb ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ماڵ‌وێران؛ ماڵ‌کاول؛ کول‌ماڵ؛ یانەوێران؛ خانەخراپ؛ ماڵ‌خراپ؛ ماڵ‌خەراب ‹در این جنگ خانەخراب شدیم: لەم شەڕەدا ماڵ‌وێران بووین›.
**خانەخرابی** / xānexarābî/: [فارسی/ عربی]*اسم.* ماڵ‌وێرانی؛ یانەوێرانی؛ خانەخراپی؛ بێ‌ئەنوایی و دەس‌بەتاڵی زۆر ‹عشق آتش بود و خانەخرابی دارد: ئەوین ئاورە و ماڵ‌وێرانی هەیە›.
**خانەدار**[1] / xānedār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* بنەوا؛ بنەوانە؛ بنەوان؛ بنەڤان؛ بەرماڵی؛ هوونەدار؛ کەیەکەر؛ ماڵداریکار؛ کەسێک، بەتایبەت ژنێ، کە بە کار و باری نێوماڵ و بەڕێوە بردنی ڕادەگا ‹خانمم خانەدار است: خێزانم بنەوایە›.
**خانەدار**[2]**:** *صفت.* کابان؛ کەبانوو؛ کەیوانوو؛ بنەڤان؛ بنەوان؛ بنەوانە؛ بنەوا؛ یانەدار؛ خاوەنی هونەر و لێهاتوویی لە ئاگاداری‌کردن و بەڕێوە بردنی کار و باری ناو ماڵ ‹خانمم زن خانەداری است: خێزانەکەم ژنێکی کابانە›.
**خانەداری** / xānedārî/: *اسم.* بنەوانی؛ بناوانی؛ بنەڤانی؛ ماڵداری؛ کەیەکەری: ١. کابانی؛ زانیاری یان هونەری بەڕێوە بردنی ماڵ و کۆمەڵە ئاگاداری سەبارەت بەو کارە (وەک چێشت‌کردن، دروومان، بەخێوکردنی منداڵان و...)

٢. بنەوایی؛ کار یان کردەوەی بنەوان ‹زنش خانەداری می‌کند: ژنەکەی بنەوانی دەکا›.

**خانەزاد** / xānezād/: صفت. خانەزا؛ خانەزاد؛ خانەزاو؛ خانەزای: ١. لە دایک بوو لە مال یان شوێنێکی دیاریکراودا ‹خانەزاد جنوب شهر: خانەزای خواری شار› ٢. مندالی کارەکەر یان نۆکەر کە لە مالی ئاغادا لە دایک بووبێ ‹غلام خانەزاد: نۆکەری خانەزاو›.

**خانەزنی** / xānezanî ، ـها/: اسم. مال‌بڕی؛ کاری دزینی کەل‌وپەلی نێو مالی خەلک؛ یانە بڕیەی ‹در تعطیلات، آمار خانەزنی بالا می‌رود: لە پشوە گشتیەکاندا، ئەژماری مال‌بری دەچێتە سەرێ›.

**خانەسازی** / xānesāzî ، ـها/: اسم. کار یان ڕەوتی مال‌کردنەوە؛ یانەوەکەردەی: ١. کردنەوەی خانوو ‹مشغول خانەسازی است: خەریکی مال‌کردنەوەیە› ٢. کۆمەلەی چالاکی ساختومانی بۆ دروست‌کردنی خانووبەرە ‹با پایان یافتن جنگ خانەسازی رونق یافت: کە شەڕ کۆتایی هات مال‌کردنەوە پەرەی سەند›.

**خانەشاگرد** / xānešāgerd ، ـها/: اسم. بەردەست؛ وەردەس؛ کوڕێژگە یان تازەلاوێ کە لە مالێکدا خزمەتکاری دەکا ‹خانەشاگردش را پیش من فرستاده بود: بەردەسەکەی ناردبووە لام›. هەروەها: **خانەشاگردی**

**خانەنشین** / xānenešîn/: صفت. گردەنشین؛ مال‌نیش؛ مالنشین؛ یانەنشین؛ خانەنشین؛ یانەگیر؛ خانەگیر؛ خانگار؛ ناچار بە مانەوە لە مال، لە بەر پیری یان نەخۆشی یان بێکاری ‹دو ماه پیش سکته کرد و خانەنشین شد: دوو مانگی پێش جەلدە لێی‌دا و گردەنشین بوو›. هەروەها: **خانەنشینی**

**خانەو زندگی** / xāne(-vo-)zendegî/: اسم. [گفتاری] مال و سامان؛ خانە و لانە؛ خای و بەرە؛ یانەوبەر؛ خان‌ولان؛ مال‌وحال؛ خانە و ژیان؛ لانە و بان؛ مال و بەتایبەت کەل‌وپەلی پێویست بۆ تێیدا ژیان ‹سیل همەی خانە و زندگی‌اش را برد: لافاو هەموو مال و سامانی برد›.

**خانەیکی** / xāneyekî/: صفت. [گفتاری] هاومال؛ هاوال؛ ئاوال؛ هاودل؛ هاودەم؛ تەبا؛ خاوەنی پەیوەندی دۆستانەی زۆر نزیک لەگەل هات‌وچووی بەردەوام بۆ مالی یەکترین.

**خاور** / xāvar/: اسم. [ادبی] ڕۆژهەلات؛ ڕوژەلات؛ خۆرهەلات؛ خۆرەلات؛ خاوەر: ١. هۆرامان؛ هۆراسات؛ خۆروەزان؛ یەکێک لە چوار لا سەرەکیەکان؛ ڕووی خۆر هەلدان ٢. هۆرگە؛ ئەو لایە خۆری لێوە هەلدێ ٣. مەلبەندانی لای ڕۆژهەلات.

◘ **خاور دور**: ڕۆژهەلاتی دوور؛ ولاتانی ڕۆژهەلاتی هیندوستان (وەک: ژاپون، مالیزی، چین، کورە، فیلیپین، ئەندونیزی و...).

**خاور میانە**: ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست؛ ولاتانی باشووری ڕۆژاوای ئاسیا لە سووریاوە تا هیند و مالیزی.

**خاور نزدیک**: ڕۆژهەلاتی نزیک؛ ولاتانی باکووری ڕۆژهەلاتی ئەفریقا تا عەرەبستان (وەک: تورکیە، سووریە، لوبنان، ئوردون و ئیسرائیل).

**خاوران** / xāvarān/: اسم. [ادبی] خۆرهەلاتان؛ سەرزەوینی لای ڕۆژهەلات.

**خاورزمین** / xāvarzamîn/: اسم. ڕۆژهەلات.

**خاورشناس** / xāvaršenās ، ـها؛ ـان/: اسم. ڕۆژهەلاتناس؛ خاوەرناس؛ کەسێ کە لە زمان و فەرهەنگ و مێژووی نەتەوەگەلی ڕۆژهەلاتی دەکۆلێتەوە.

**خاورشناسی** / xāvaršenāsî/: اسم. خاوەرناسی؛ ڕۆژهەلاتناسی؛ زانستی خوێندنەوە و لێکۆلینەوە لە زمان و فەرهەنگی ولاتانی ئاسیا و ئەفریقا و توێژینەوە لە هەموو لایەنە جیاوازەکانی.

**خاوری** / xāvarî/: صفت. [ادبی] ڕۆژهەلاتی؛ خۆرهەلاتی: ١. سەر بە ڕۆژهەلات ‹خورشید

خاوری: هەتاوی ڕۆژهەلاتی› ٢. جێگرتوو لە ڕۆژهەلاتدا ‹سرزمینهای خاوری: ولاتانی ڕۆژهەلاتی›.

**خاوش** / xāvûš ، ـها/: *اسم.* ١. خەیارتۆم؛ خەیارێک کە زۆر گەورە بووە و بۆ توو هەلگیراوە ٢. کالیار؛ ترۆزی گەورەی ترش بووی بۆ توو دانراو.

**خاوند** / xāvand ، ـان/: *اسم. [جامعەشناسی]* دەرەبەگ؛ فیئۆدال.

**خاوندسالاری** / xāvandsālārî/: *اسم. [جامعەشناسی]* خێوەندسالاری؛ فیئۆدالیسم؛ دەرەبەگی؛ دەرەبەگایەتی.

**خاویار** / xāv(i)yār ، ـها/: *اسم.* خاویار؛ خای چەند جۆر سەگ ماسی، بە ئەندازەی نیسکێک و بە ڕەنگی زەرد، خورمایی، خۆلەمێشی یان ڕەشەوە کە خواردەمەنیەکی یەکجار هێزنگ و گرانباییە.

**ـ خای** / xāy/: *پیواژه. [ادبی]* ـ جاو؛ ـ ژاو؛ ـ جوی؛ ـ کروچ؛ ـ کرۆژ؛ ـ هار؛ ـ کرمێن؛ ـ خرمێن؛ ـکونجێن ‹شکرخای: شەکەرجاو›.

**خایف** / xāyef ، ـان/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ترسەنۆک؛ نەوێر؛ بێجەرگ؛ بەزدونەک؛ تەرسەزال؛ ترسەزاور؛ کەلەزات؛ بێزات؛ قزە؛ بێورە ‹خاین خایف است: دوخمان ترسەنۆکە›: **خائف**

**خاین**[1] / xāyen ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* دوخمان؛ کەسێ کە تووشی تاوان و خەیانەت بووە ‹خاین باید مجازات شود: دوخمان دەبێ سزا بدرێ›: **خائن**

**خاین**[2]: *صفت.* دوخمان؛ خاوەنی خووخدە یان هۆگری بە خەیانەت ‹تاریخ قضاوت خواهد کرد که او خاین بود یا خادم: مێژوو داوەری دەکا دوخمان بوو یان خزمەتکار›.

**خایه** / xāye/: *اسم.* ١. ـها/ خا؛ گون؛ گورن؛ گونک؛ باتوو؛ خایە؛ وەتە؛ هێلکەگون؛ هێک؛ ماک ٢. *[گفتاری]* جەرگ؛ نەترسی؛ بوێری ‹جنگیدن خایه می‌خواهد: شەڕکردن جەرگی دەوێ›.

**خایەدار** / xāyedār ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* نەترس؛ بەجەرگ؛ دلێر؛ ئازا؛ مەرد؛ بوێر ‹در میان شما آدم خایه‌داری پیدا نمی‌شد جوابشان را بدهد: لە نێو ئێوەدا کەسێکی نەترس نەبوو ولامیان بداتەوە›.

**خایەمال** / xāyemāl ، ـها/: *صفت. [تعریض]* ماستاوچی؛ ماستاوکەر؛ پیازپاککەر؛ خایەمال؛ دالانەمال؛ خۆڕێخەر؛ خۆڕێکخەر ‹آنها دنبال یک خایه‌مال بودند که به حرفشان گوش کند: ئەوان لە دووی ماستاوچیەکدا دەگەڕان بە قسەیان بکات›.

**خایەمالی** / xāyemālî/: *اسم. [تعریض]* ماستاوکەری؛ پیازپاککەری؛ خۆڕێخەری؛ خۆڕێکخەری؛ خایەمالی.

**خاییدن** / xāyîdan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**خاییدی**: کرماندت؛ **می‌خایی**: دەکرمێنی؛ **بخای**: بکرمێنە// کرماندن؛ کرتاندن؛ داکرووژتن، کرۆشتن؛ کرۆژتن؛ جاوین؛ جووین؛ داقرتاندن؛ داکرۆژتن؛ کرۆتن؛ کونجین؛ کونجاندن؛ کۆتش؛ هاڕین؛ خرماندن؛ کرمنەی؛ کرمنای؛ خرمنەی؛ کرۆتەی؛ شتێ بە ددان هاڕین: **خائیدن**. هەروەها: **خاییدنی**

■ مصدر منفی: **نَخاییدن** (نەکرماندن)

**خب** / xob/ ☜ **خوب**

**خبائث** / xabā'es/: [عربی] ☜ **خبایث**

**خباثت** / xebāsat, xabāsat/: [عربی] *اسم. [ادبی]* چەپەلی؛ پەستی؛ پەلەشتی؛ گەماری؛ ناخاری؛ پیسی؛ ناپیاوی؛ ناکەسی. هەروەها: **خباثت کردن**

**خباز** / xabbāz ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم. [ادبی]* نانەوا؛ نانکەر؛ نان‌پات؛ نانەپەچ (بۆ نێر)؛ نانەپەچە (بۆ مێ).

**خبازی** / xabbāzî ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* نانەوایی؛ نان‌برێژی؛ نانواخانە.

**خباك** / xabāk/: *اسم.* ١. پەچە؛ حەوشە؛ کۆز؛

پەرچە؛ جێگەی دەورگیراوی بێ‌میچ، تایبەتی چاودێری مالات ٢. *[مجازی]* تەنگەترپزێ؛ گورمۆڕە؛ گورتال؛ گوردەم؛ جێگەی تەنگ و چڕ.

**خبایث** / xabāyes/: [عربی] جمعِ ☜ **خبیث**: **خبائث**

**خبث** / xobs/: [عربی]*اسم. [ادبی]* پیسی؛ چەپەڵی: ١. پۆخڵی؛ ناپاکی؛ پەلەشتی؛ گەماری ٢. نامەردی؛ ناپیاوی؛ ناکەسی.

▣ **خبث طینت:** بەد ڕەسەنی؛ بەو ڕەسەنی؛ بەو جنسی.

**خبر** / xabar/: [عربی]*اسم.* ١. *ـها*؛ اخبار/ هەواڵ؛ خەبەر؛ خەوەر؛ خەوەر؛ خەڤەر؛ نووچە؛ هاڵوهەواڵ؛ دەنگ‌وباس؛ نەقڵێک سەبارەت بە ڕووداوێ ‹خبر تصادف قطار: هەواڵی پێک‌دادانی قەتار› ٢. *ـها/[دستور]* گوزارە؛ بەشێ لە ڕستە کە واتا تەواو دەکا ٣. *[اسلام]* پەیام؛ وتەی پێغەمبەران و پێشەوایان ٤. *ـها/[چاپ]* خەبەر؛ نووسراوێک کە لە رووی، پیت‌چنی دەکەن و دوایی لە چاپی دەدەن ٥. ئاگا؛ هاگا؛ خەبەر؛ خەوەر؛ ئاگاداری؛ جەی؛ هەواڵ ‹از او خبری ندارم: ئاگام لێ نیە› ٦. باس؛ ڕووداو؛ خەوەر ‹نمی‌دانم چە خبر بود کە همە با عجلە می‌دویدند: نازانم چ باس بوو هەموو بە پەلە دەڕۆیشتن›.

▣ **خبر خیر:** خەبەری خێر؛ هەواڵی ڕووداوێکی خۆش.

▣ **خبر بودن:** دەنگ‌وباس بوون؛ ڕووداوێ ڕوودان ‹خبری بود؟: دەنگ‌وباسێک بوو؟›.

**خبر دادن:** هەواڵ دان؛ دەنگ دان؛ ئاگا کردن؛ خەبەر دان ‹خبر آمدن شما را دیروز بە من دادند: هەواڵی هاتنی تۆیان دوێنێ پێم دا›.

**خبر داشتن:** خەبەر بوون؛ دەنگ‌وباس بوون؛ ئاگادار بوون؛ هەواڵ لێ زانین؛ هاگا چنەبیەی ‹از او هیچ خبری نداریم: هیچ خەبەریکمان لێ نیە›.

**خبر رساندن:** ١. ڕاگەیاندن؛ هەواڵ دان؛ خەبەرکردن ‹خبر آمدنشان را بە همە برسان: هەواڵی هاتنیان بە هەمووان ڕاگەیێنە› ٢. شووفاری‌کردن؛ چاوانی‌کردن؛ چاوشی کردن؛ قسە هێنان و بردن ‹کارش خبر رساندن بە دشمن بود: ئیشی شۆفاری کردن بوو بۆ دژمن›.

**خبر شدن:** ١. ئاگادار بوون؛ بەخەبەر بوون؛ هەواڵدار بوون؛ های بوون؛ ئەوەڕەسیاین ‹خبر شدیم کە او از سفر برگشتە است: ئاگادار بووین لە سەفەر گەڕاوەتەوە› ٢. شتێ قەومان؛ شتێ ڕوودان ‹مثل این‌کە باز خبری شدە است: وا دیارە دیسانەوە شتێ قەوماوە›.

**خبر کردن:** ١. ئاگادارکردن؛ بەخەبەرکردن؛ ئەوڕەسەنی ‹رفت و همە را از آن رویداد خبر کرد: ڕۆی و هەمووی لەو ڕووداوە ئاگادارکرد› ٢. بانگ کردن؛ بانگهێشتن‌کردن؛ دەنگ‌کردن ‹پزشک خبر کردیم: پزیشکمان بانگ‌کرد›.

**خبر کسی را آوردن:** *[مجازی]* خەوەر کەسێ هاوردن؛ چەو ئەوردن؛ خەبەری مەرگی کەسێ دان ‹بعد از سە روز خبرش را آوردند: دوای سێ‌ڕۆژ خەوەریان هاورد›.

**خبر گرفتن:** هەواڵ زانین؛ ئاگایی بەدەس هێنان؛ خەبەر زانین ‹رفتم از دوستانم خبر بگیرم: چووم هەواڵی دۆستانم بزانم›.

**خبری نبودن:** باس نەبوون: ١. بەرهەڤ نەبوون؛ ئامادە یان ساز نەبوون ‹امسال از برف خبری نیست؟: ئەمساڵ لە بەفر باسێک نیە› ٢. دەنگ نەبوون؛ کارەساتیک ڕوو نەدان ‹در خانە خبری نبود: لە ماڵەوە دەنگێ نەبوو›.

**خبرچین** / xabarčīn ، ـها/: [عربی/ فارسی]*اسم.* شۆفار؛ چەوانی؛ چاوش؛ خەبەرگوهێز؛ قسەڕاگوێز: ١. قسەبەر؛ خەفیە؛ زوانگێڕ؛ خەوەرچن؛ کەسێ کە نهێنی و کاری کەسان بۆ کەسانی دیکە دەگێڕێتەوە ٢. سیخوور؛ سیخوڕ؛ کەسێ کە بە مز، هەواڵ ـ لە بارەی کەس یان بابەتی دیاریکراو ـ کۆ دەکاتەوە. هەروەها:

خبرچینی

**خبرخوان** / xabarxān ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ١. هەواڵبێژ؛ کەسێ کە دەقی هەواڵ دەخوێنێتەوە ٢. هەواڵبێژ؛ بێژەری هەواڵی رادیۆ یان تەلەفیزیون ٣. [چاپخانە] هەڵەگر؛ نموونەخوێن؛ نموونەوان؛ کەسێ کە دەقێک بۆ راستکردنەوەی هەڵەی چاپی دەخوێنێتەوە.

**خبردار** [1] / xabardār/: [عربی/ فارسی]/اسم. [نظامی] خەبەردار؛ دۆخ یان چۆنیەتی بە پێوە ڕاست و ڕەپ وەستان. هەروەها: **خبردار ایستادن**

**خبردار** [2]: صفت. ئاگادار؛ هاگادار؛ گوێبیس؛ خەبەردار؛ بەئاگا ‹همە از ماجرا خبردار بودند: هەمووان ئاگاداری ڕووداوەکە بوون›. هەروەها: **خبردار شدن؛ خبردار کردن**

**خبردار** [3]: صوت. خەبەردار؛ دەستووری ڕاوەستان بە شێوەی خەبەردار.

▣ **خبردار دادن:** فەرمانی خەبەردار دان.

**خبرساز** / xabarsāz ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. نووچەچێکەر؛ دەنگوباسساز؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی نووچەچێکاریەوە.

**خبرسازی** / xabarsāzî/: [عربی/ فارسی]/اسم. نووچەچێکاری؛ دۆخ یان چۆنیەتیەک کە دەبێتە هۆی بەدیهاتنی هەواڵ.

**خبرگزار** / xabargozār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. هەواڵنێر؛ هەواڵدەر؛ خەبەردەر؛ کەسێک کە بۆ دامەزراوەی خڕکردنەوە و ڕاگەیاندنی هەواڵ، دەنگوباس دابین دەکا.

**خبرگزاری** / xabargozārî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. هەواڵنێری؛ پەیامنێری: ١. دامەزراوەیەک کە کاری کۆکردنەوە و ڕاگەیاندنی هەواڵە ٢. کاری بەدەسهێنان و ڕاگەیاندنی هەواڵ.

**خبرگی** / xebregî, xobregî/: [عربی/ فارسی] /اسم. لێزانی؛ پسپۆڕی؛ کارامەیی؛ چازانی ‹طلافروشی، خبرگی می‌خواهد: زێڕفرۆشی، لێزانی دەوێ›.

**خبرنگار** / xabarnegār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. هەواڵنێر؛ پەیامنێر؛ ولامنێر؛ خەبەردەر؛ کەسێ کە کاری نووسین و ڕاگەیاندنی هەواڵە.

**خبرنگاری** / xabarnegārî/: [عربی/ فارسی]/اسم. ١. پەیامنێری؛ ولامنێری؛ خەبەردەری؛ هەواڵنێری ٢. کار و ڕەوتی وەگیرهێنان و ڕاگەیاندنی هەواڵ لە ڕۆژنامە، ڕادیۆ یان میدیاکانەوە.

**خبره** [1] / xebre, xobre ، ـها؛ ـگان/: [عربی]/اسم. لێزان؛ پسپۆڕ؛ کارامە؛ شارەزا؛ سەردەرچووگ؛ تێگەیشتوو ‹یک خبره بیاورید، خانه را قیمت بگذارد: لێزانێ بێنن، نرخ بخاتە سەر ماڵەکەوە›.

**خبره** [2]: صفت. کارناس؛ پسپۆڕ؛ لێزان؛ کارامە؛ سەردەرچووگ؛ خاوەن ئاگاداری یا پسپۆڕی لە یەک یان چەن بابەتدا ‹او در کار قالی خبره است: ئەو لە کاری قاڵیدا لێزانە›.

**خبری** / xabarî/: [عربی] صفت. هەواڵی؛ پێوەندیدار یان سەر بە هەواڵ، بەتایبەت وەگیرهێنان و بلاوکردنەوەی دەنگ و باس ‹برنامەی خبری: بەرنامەی هەواڵی›.

**خبط** / xabt/: [عربی]/اسم. نەزانکاری؛ هەڵە؛ خەتا.

▣ **خبط دماغ:** سەر لێشێواوی؛ مێشک پەشێوی؛ هزر پەشۆکی؛ ئاوەز ئاڵۆزی.

▣ **خبط کردن:** نەزانکاری کردن؛ هەڵەکردن؛ بە هەڵەدا چوون؛ خەتا کردن؛ سەهۆکردن ‹خبط کردم کە تو را با خودم نبردم: نەزانکاریم کرد تۆم لەگەڵ خۆم نەبرد›.

**خبیث** / xabîs ، ـها؛ ـان ، خبائث/: [عربی] صفت. پیس؛ چەپەڵ: ١. [نامتداول] پەلەشت؛ گەمار ٢. ناکەس؛ نامەرد؛ ناپیاو؛ بەدفەڕ؛ دڵخراب؛ دڵڕەش؛ ناخار ‹هنوز زود است کە این موجود خبیث را بشناسی!: کوا جارێ تا ئەم هەتیوە پیسە بناسی!›.

**خپل** / xepel/ ☜ **خپله**

**خپله** / xepele ، ـها/: صفت. [گفتاری] خەپەلانە؛

خه‌پەلە؛ خڕین؛ خەپـەرە؛ خەپەتۆڵـە؛ خـەپۆل؛ خەپەلێ؛ خەپوخڕە؛ خرتە؛ خرنۆڵ؛ خڕ؛ خڕنگە؛ قەڵەوی کورتەبالا ‹یک زن خپله نشسته بود پهلویش: ژنێکی خەپەلانە لە پاڵ دەستیەوە دانیشتبوو›: **خپل**

**ختائی** / xatā'î/ ☜ **ختایی**

**ختـام** / xetām/: [عربـی]/اسـم. [ادبـی] کۆتـایی؛ دوایی؛ دمایی؛ دومـاهی؛ ئاکـام؛ ئـەنجام؛ ئـاخر؛ بنەتا ‹ختام عمر: کۆتایی ژیان›.

**ختـان** / xetān/: [عربـی]/اسـم. [ادبـی] خەتەنـە؛ خێتەنە؛ خەتنە؛ سوننەت.

**ختـایی** / xetāyî/: اسـم. نەخـشی خـەتایی؛ نەخشێکی ڕازێنەرە لە نیگارکێشی، تـەونکاری و وەک ئەوانـەدا بـە شـێوەی ڕیزێـک لـە گـوڵ و دەوەن و خونچە و گەڵا: **ختائی**

**ختم**[1] / xatm/: [عربی]/اسم. ١. دوایـی؛ دمـایی؛ تەواو؛ تەمام؛ تـەواو؛ کۆتـایی؛ ئـاخر ‹ختم کـردن: دوایـی پـێهێنـان› ٢. پرسـانە؛ پرسـە؛ پەرسـە؛ سەرەخۆشـی ‹بـرایش ختـم گرفتنـد: پرسـەیان بـۆ گرت›.

◻ **خـتم شـدن**: کۆتـایی هـاتن؛ دوایـی هـاتن؛ کۆتایی پێهـاتن؛ بـە ئاکـام گەیـشتن؛ تـەواو بوون؛ دوایی هاتن؛ ئـاخر هـاتن؛ دمـا ئامـەی ‹جلسه ختـم شـد: دانیـشتنەکە کوتـایی هـات›.

هەروەها: **ختم کردن**

**ختم گرفتن**: پرسە دانان؛ پرسـانەگرتن؛ فاتحـا خـوێنیگـرتن؛ پەرسـە نیـایرە؛ سەرەخۆشـی دانـان ‹بـرایش ختـم بزرگـی گرفتنـد: پرسـەیەکی گەورەیان بۆ گرت›.

**ختم**[2]: صفت. [گفتاری] سەرهات؛ سەر؛ سـەرامەد؛ سەرامەت؛ ئاخر؛ لە سەرووی هەمووان بەتایبەت لە بەدکاریدا ‹ختم روزگار: سەرهاتـی ڕۆژیار›.

**ختمی** / xatmî ، ـها/: [عربی]/اسم. هێـرۆ؛ هێـروو؛ هەرملی؛ هەرمەلی؛ هەیرۆ؛ هەرمەڵە؛ هەڵمەڵە؛ هەرمەڵێ؛ گیـایێکی سـاقەتە و گـەڵا کولـکن و نەرم، ڕیشە درێژ، گەڵا پان، گوڵ گـەورەی ئـاڵ یان مەیلەو ئەرخەوانیە کە لە کۆتایی سـاقەتەوە بە شـێوەی دەسـتەیەکی سـێدانـەیی لـێدێ، چەند جۆری ڕازێنەری و دەرمانی هەیە: **خطمی**

**ختنه** / xatne/: [از عربی]/اسم. خەتەنـە؛ خەتنـە؛ خێتەنە؛ کاری برین و هەڵگرتنی پێـستی سـەر چووکی نێرینە. هـەروەها: **ختنـه شـدن؛ ختنـه کردن**

**ختنـه‌سـوران** / xatnesûrān ، ـهـا/: [از عربـی/ فارسی]/اسم. خەتەنەسـووران؛ خرووسـەبڕان؛ نـان خەتەنە؛ بەزم و بانگیشتن بەهۆی خەتەنەکردنی کوڕیژگانەوە.

**خجالـت** / xecālat, xacālat/: [عربـی]/اسـم. شـەرمەزاری؛ شـەرمەندەیی؛ سەرشکـستی؛ تەریقی؛ خەجاڵەت؛ فهێتکاری؛ فەدیکاری.

◻ **خجالـت دادن**: شـەرمەزارکردن؛ خەجاڵـەت کردن (زۆرتر بە بۆنەی ئەنجامـدانی خزمـەتێکی شیاوەوە) ‹خیلی خجالتمان داد: ئێجگار شەرمەزاری کردین›.

**خجالـت داشـتن**: جـێ شـەرمەزاری بـوون؛ شوورەیی بوون؛ هۆی سەرشکستی بوون ‹آقا جان، نکنید! این کارها خجالت دارد: کاکـە گیـان، مەکەن! ئەم کارانە جێ شەرمەزارین›.

**خجالـت کـشیدن**: شـەرماهی کـردن؛ تـەریق بوونـەوە؛ تەریقـەوە بـوون؛ شـەرمەزار بـوون؛ شەرمەندە بوون.

**از خجالت آب شدن**: [مجازی] داڕزان؛ بوون بە تنۆکێ ئاو؛ بە ئەرزێـدا چوونـە خـوار؛ زۆر بـە خۆدا شکانەوە؛ خراپ تەریق بوونەوە.

**از خجالت کـسی درآمـدن**: [مجازی] لـە ژێـر شـەرمەزاری کەسـێ دەرهـاتن؛ قـەرەبوو کردنەوە؛ قەرەبوو دانەوە ‹انشاءالله از خجالتشان درمـیآیـیم: خـوا یـار بـێ لـە ژێـر شـەرمەزاریان دەردیێن›.

**خجالت‌آور** / xecālatāvar, xacālat-/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. شـەرمهێنـەر؛ شـەرماوەر؛

ڕووشکێنەر؛ مایەی شەرمەزاری.

**خجالت‌زده** / xecālatzade, xacālat-/: [عربی/ فارسی] صفت. شەرمەنە؛ شەرمەزار؛ ڕووشکاو؛ تەریقەو بووگ.

**خجالتی** / xecālatî, xacālatî/: [عربی] صفت. [گفتاری] شەرمن؛ شەرمنە؛ شەرموو؛ شەرمۆ؛ شەرمۆک؛ شەرمی؛ بەشەرم؛ شەرمین؛ شەرمێون؛ بێڕوو؛ ڕووتەنک؛ ڕوونەرم؛ کەمڕی؛ کەمڕوو؛ بێ دەم و پل؛ دەم پەلۆ؛ بێدەم؛ فەدیکار ‹عروس خیلی خجالتی است: بووک زۆر شەرمنە›.

**خجستگی** / xocastegî/: اسم. پیرۆزی؛ بەودمی؛ ممبارەکی؛ مبارەکی؛ بار و دۆخی پیرۆز بوون.

**خجسته** / xojaste/: صفت. [ادبی] پیرۆز؛ بەودم؛ بەفەڕ؛ موبارەک؛ ممبارەک ‹عیدتان خجسته باد: جێژنتان پیرۆز بێ›.

▣ **خجسته‌پی:** قەدەم پیرۆز؛ پێ وەخێر.

**خجسته‌روز:** بەختەوەر؛ خۆشبەخت.

**خجل** / xecel, xacel/: [عربی] صفت. شەرمەزار؛ شەرمسار؛ شەرمەندە؛ فەدیکار؛ خەجاڵەت؛ تەرێق؛ تەریق؛ بوور؛ فهێت‌کار؛ ڕووڕەش.

▣ **خجل شدن:** شەرمەزار بوون؛ تەرێق بوونەوە؛ شکانەوە؛ خەجاڵەت بوون؛ بوور بین؛ شکیانەوە. هەروەها: **خجل بودن؛ خجل کردن**

**خجلت** / xeclat, xaclat/: [عربی] اسم. [ادبی] شەرمەزاری؛ سەرشکستی؛ ڕووشکاوی؛ خەجاڵەت؛ خەجاڵەتی؛ دری؛ فەدی؛ ڕووگیری؛ تەریقی ‹ببخشید این تأخیر بنده اسباب خجلت شد: ببوورن دواکەوتنم بووە هۆی شەرمەزاری›.

**خجلت‌آور** / xeclatāvar, xaclat-/: [عربی/ فارسی] صفت. [ادبی] مایەی شەرمەزاری؛ ڕووشکێنەر؛ شەرمهێنەر ‹رفتار خجلت‌آور: ئاکاری مایەی شەرمەزاری›.

**خجلت‌زده** / xeclatzade, xaclat-/: [عربی/ فارسی] صفت. [ادبی] شەرمەزار؛ شەرمەنە؛ تەریقەوبووگ؛ ڕووگیر.

**خجول** / xacûl/: [عربی] صفت. شەرمن؛ شەرمین؛ شەرمێون؛ شەرمێوک؛ کەمڕوو؛ بە هەستی شەرمەوە لە بەرانبەر خەڵکدا کە ئەبێتە بەرهەڵستێک بۆ دەربڕینی مەبەستی خۆ.

**خدا** / xodā/: اسم. خودا؛ خوا؛ خوداوەند؛ خواوەن؛ خولا؛ خودێ: ١. یەزدان؛ هوومای؛ هۆمای؛ هووما؛ هۆما؛ هۆمان؛ بینایی چاوان؛ بینایا چەهڤان؛ یەزن؛ ئێزد؛ هەڤیازترین و هەرە بەرزترین هۆی ئارمانی؛ داهێنەر و ڕاهێنەری جیهان ٢. [اسلام] هەق؛ کردگار؛ هەبووی تاکانە و بێ‌هەمبەری هەتایی و هەرمان کە تەن و گۆدە نیە، نەزاوە و ئافرێنەری جیهانە ٣. ـها؛ ـیان/[قدیمی] خودان؛ خاوەند؛ خێوەند؛ خێو؛ وەدیهێنەر و کارگێڕی یەک یان چەند ماکی سروشتی ‹خدای آتش: خودانی ئاور›.

▣ **خدا ـ خدا کردن:** خوا ـ خوا بوون/ کردن؛ لە خودا ویستن؛ جە خوای واسەی؛ جە خوای گەرەک بیەی ‹خدا ـ خدا می‌کرد، کسی او را در این حال نبیند: خوا ـ خوای بوو، کەسێ لەم دۆخەدا نەیبینێ›.

**خدا خواستن:** خودا ویستن؛ خوا پێ خۆش بوون؛ خوا مەیل بوون؛ خوا گەرەک بیەی؛ خوا ڕای لە سەر بوون؛ ویست و خواستی خوا لە سەر بوون ‹خدا خواست و عروسی سر گرفت: خودا ویستی و گۆوەندەکە سەری گرت›.

هەروەها: **خدا دادن؛ خدا رساندن؛ خدا کردن؛ خدا نکردن**

**خدا را بنده نبودن:** [مجازی] خوای خۆ بەحەق نەناسین؛ لە خۆ بایی بوون؛ خۆپەسێن و خۆسەپێن بوون ‹از وقتی رییس شده دیگر خدا را بنده نیست: لە کاتێکەوە بووەتە سەرۆک، خوای خۆی بە حەق ناناسی›.

**خدا و خرما را با هم خواستن:** [مجازی] خورمژ گەرەک بوون؛ بە داخوازیگەلی یەکنەگر و

ناتەباوە بوون.

**خدائی** / xodā'î/ ☜ **خدایی**

**خدابـــدور** / xodābedûr/: دعـا. [گفتـاری] خــوا نەیتێریٚ؛ لـە خـوا ئـەو ڕۆژە نـەکا؛ خـوا دووری بخاتەوە (تێبینی: بۆ بێزاری لە شـتێک دەگـوترێ) ‹خدابدور، آنجا هم شهر است که می‌خواهی بروی؟: خوا نەیتێری، ئەوێش شارە دەتەوێ بڕۆی؟›.

**خـــدابیامرز** / xodābiyāmorz/: صـفت. خــوا لێخۆشبوو؛ خوا عــەفوو کــردگ؛ ڕەحمــەتی ‹آن خدابیامرز یک روز خوش ندید: ئـەو خـوا لێخوشـبووە، ڕۆژێکی خۆشی نەدی›.

**خــدابیامرزی** / xodābiyāmorzî/: اسم. ڕەزای خوا؛ خوا لێ‌ڕازی بوون؛ خوا لـێ خـۆش بـوون؛ کردەوە یان ئاکارێ کە دەبێتە هۆی ڕەزامەندی و دۆعـای خێـری خەڵـک ‹او ایـن کـار را بـرای خدابیامرزی می‌کند: ئەم کارە بۆ ڕەزای خوا دەکا›.

**خداپرســت** / xodāparast، ـهـا؛ ـان/: صـفت. خواپەرس؛ خواپەرەس؛ خودایەرست؛ خواپرێس؛ خواخواز؛ یەزدۆ؛ پەرسدار؛ پەرستێنەری خودا.

**خداپــسندانه** / xodāpasandāne/: صفت. خــوا پەسندانە؛ شیاوی پەسن و ڕەزای خودا ‹کارهـای خداپسندانە: کارگەلی خواپەسندانە›.

**خــداترس** / xodātars، ـــهـا؛ ـان/: صـفت. لـە خواترس؛ جە خواتــەرس؛ پارێزکـار ‹دنبـال یـک مستأجر سالم و خداترس می‌گردم: بـۆ کـرێ‌نـشینێکی پاک و لەخواترس دەگەڕم›.

**خــداجو** / xodācû، ـیـان/: صـفت. خــواپرس؛ خواخواز؛ خواواز؛ خواخوا؛ شوێن‌هەڵگری ڕێگەی گەیشتن بە خودا و ڕەزامەندی خودا

**خــداحافظ** / xodāhāfez/: [فارسـی/ عربـی] دعـا. خواحافیز؛ مالاوا؛ مالاڤا؛ خاترێ وە؛ خـاتری تـە؛ لە پەنای خوا؛ خوا پارێزەر بێـت (تێبـینی: کـاتی جوێ بوونەوە لە کەسێ دەگـوترێ) ‹بابـا! خداحافظ، من رفتم: بابە! خواحافیز، ئەوا من چووم›.

**خداحافظی** / xodāhāfezî/: [فارسی/ عربی] اسم. خاترخازی؛ خواحافیزی؛ مالاوایی؛ خـاترخوازی؛ وەدا؛ دووا؛ مالاڤایی: ١. کار یـان ڕەوتی گـوتنی ماڵئاوا ‹بی خداحافظی رفت: بـێ مـالاوایی چـوو› ٢. ڕێوڕەسمێ کە لە کاتی ڕۆیشتنی کەسێ لە شوێنێک بەڕێوە دەچێ.

**خـــداداد** / xodādād/: صـفت. [ادبـی] خـــواداو؛ خواداگ؛ خواداو؛ خـوادا؛ بەشـی خـوایی ‹ثـروت خداداد: سامانی خواداو›: **خدادادی**

**خدادادی** / xodādādî/ ☜ **خداداد**

**خداسالاری** / xodāsālārî/: اسم. ١. دەسەڵاتداری بـە پێـی ئامۆژگـاری و باوەڕگــەلی دینێکـی دیـاریکراوەوە ٢. شـێوە دەسـەڵاتداریەک کـە بنەڕەت و بنەمای قانوونی خـۆی دیـاریکراو لـە لایەن خوا و هەمبەر بە ویستی ئەو دەناسێنێ.

**خداشـــناس** / xodāšenās، ـــهـا؛ ـان/: صـفت. خواناس؛ خواژناس؛ بڕوامەند بە هەبوونی خودا.

**خداشناســی** / xodāšenāsî/: اسم. خواناسـی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی بـاوەڕ بـە هــەبوونی خـوا ٢. زانستە ئایینیەکان؛ زانستی سەربە خواناسی.

**خــداقوت** / xodāqovvat/: [فارسی/ عربی] دعـا. ماندوو نەبی/ نەبن؛ قەوەت لە خوا؛ خـوا بـە تـۆ هێزی کار کردن بدا؛ خوا یـار بـێ (تێبـینی: بـۆ کەسـێ خـەریکی کـارێکی دژوارە ئێـژن) ‹تـا شـب برایش کار کردم، یک خداقوت هم نگفت: هەتا شـەوێ کارم بۆ کرد، ماندوو نەبێکیشی نەگوت›.

**خدام** / xoddām/: [عربی] جمع ☜ **خادم**

**خدانخواســـته** / xodānaxāste/: دعـا. خـــوای نەخواسـە؛ خـوا نەخواسـە؛ خوانەخواسـتە؛ خـوا نەکا؛ ڕوو نەدا؛ دووربا؛ بە دوور بێ ‹مواظـب بـاش! اگر خدانخواسته کیفت را گم کنی، مـی‌مـانی: وریـا بـە! ئەگــەر خــوای‌نەخواســە کیفەکــەت ون کــەی، دادەمێنی›.

**خدانـشناس** / xodānašnās، ـــهـا؛ ـان/: صـفت. خوانــەناس؛ خوانــەژناس؛ نــاخودا؛ نائاگـا لــە هەبوونی خوا، یان بێ‌بڕوا بە هەبوونی.

**خدانکرده** / xodānakarde/: *دعا.* دووروا؛ دووربا؛ دووربێ؛ خوای نەخواسە؛ خوا ئەو ڕۆژە نەکا؛ دوور بانەیە؛ لە خودام دەوێ ڕوو نەدا (زۆرتر سەبارەت بە ئەگەری ڕووداوێکی خراپ دەگوترێ) ‹برگرد ! خدانکرده گرفتار میشوی: بگەڕەوە! دووروا تووش دەبی›.

**خدانگهدار** / xodānegahdār/: *دعا.* خوائاگادار؛ خواهاگادار؛ لە پەنای خوا؛ خوا لە سەرت؛ خوا پشت و پەنات بێ؛ لە ئەمان خوا؛ خوا لەگەڵت؛ خوا لە پشتت؛ خوا چنیت بۆ؛ خوا بتپارێزێ؛ خودا ئاگاداری تۆ بێ (زۆرتر کاتی جودایی و لە پەرسڤی خوداحافیزیدا دەگوترێ) ‹گفتم: «مادر من رفتم»، گفت: «خدانگهدار، برو بسلامت»: گوتم: «دایە ئەوا من چووم»، گوتی: «برۆ خوائاگادارت، بە خێر چی»›.

**خداوکیلی** / xodakîlî/: [فارسی/ عربی] *قید.* *[گفتاری]* خودا مابەین؛ خوا وەکێل؛ خوا لە بەینا بێ؛ بەڕاستی؛ لە ڕاستیدا ‹خداوکیلی، میترسیدم بروم: خودا مابەین دەترسام بڕۆم›.

**خداوند** / xodāvand/: *اسم.* ١. خواوەند؛ خوا؛ خودا؛ خودێ؛ خواوەن؛ خوداوەند؛ خوودا؛ خوێیا؛ خولا؛ بینایپاچەهڤان؛ بینایی‌چاوان ‹به نام خداوند جان آفرین: بە نێوی خواوەندی گیان ئافرێن› ٢. *[ادبی]* خاوەن؛ خاوەند؛ خێوەند؛ خاون؛ خێو؛ ددار؛ دار؛ خودان؛ خویگ؛ ساحێو؛ ساحیب.

**خداوندا** / xodāvandā/: *صوت.* خواوەندا؛ خوایا؛ خودایە؛ ئەی خوا؛ ئەی خودا؛ خواگیان ‹خداوندا! امید دل تویی تو: خواوەندا! دلم هیوای بە تۆیە›.

**خداوندگار** / xodāvand(e)gār/: *اسم.* *[ادبی]* خاوەن؛ خواوەن؛ خودا؛ خاوەند؛ خێو؛ خواوەند ‹خداوندگار جهان: خاوەنی جیهان›.

**خداوندگارا** / xodāvand(e)gārā/: *صوت.* ئەی خوایە؛ خواوەندا؛ خوایا؛ خوایە؛ ئەی خودا؛ خواوندا ‹خداوندگارا! ما را ببخش: ئەی خوایە! لێمان خۆش‌بە›.

**خداوندی** / xodāvandî/: *اسم.* خوایی؛ خواوەنی؛ خواوەندی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خودا بوون ‹به خداوندی خدا قسم: سوێند بە خواوەندی خوا›.

**خدایا** / xodāyā/: *صوت.* خوایا؛ خوایە؛ یا ڕەببی؛ هەقۆ؛ هاوار لە تۆ خوایە ‹خدایا! به فریادم برس: خوایا! بێ بە هانامەوە؟›.

**خدایگان** / xodāygān/: *اسم.* *[قدیمی]* ١. خودا؛ یەزدان؛ خواوەن ٢. شای گەورە؛ شای شاهان.

**خدایی**[1] / xodāyî/: *اسم.* خودایی؛ خودێتی؛ خودایەتی؛ خولایی؛ خوایی؛ یەزدانی ‹کم‌کم داشت ادعای خدایی می‌کرد: وردەوردە خەریک بوو داوای خودایی دەکرد›: **خدائی**

**خدایی**[2]: *صفت.* خودایی؛ یەزدانی؛ پێوەندیدار یان سەر بە خوا ‹پیام خدایی: پەیامی خوایی›.

**خدایی**[3]: *قید.* *[گفتاری]* ١. لە خواوە؛ لە خوداوە؛ جە خوایوە؛ لە لایەن خواوە و بە پێی ویستی ئەو (خدایی بود که توانستم این خانه را بگیرم: لە خواوە بوو توانیم ئەم خانووە بگرم) ٢. خواییەکەی؛ خودایی؛ خوایی؛ بە ڕاستی ‹خدایی می‌بایست کمکش می‌کردیم: خوایەکەی دەبوا یارمەتیمان بدابا›: **خداییش** * **خدائی**

**خداییش** / xodāyîš/ ☜ **خدایی**[3]‏-٢

**خدشه** / xadše ، ـها/: [عربی] *اسم.* رووشە: ١. *[نامتداول]* رووش؛ ڕوویش؛ ڕیش؛ ڕووک؛ شەقتی؛ شوێنەوارێ کە بە هۆی پێدا کشانی شتێکی تیژ بەدی دێ ٢. زیان؛ وەزەنگ؛ وەزەن؛ ئازار؛ سەدەمە؛ بەلا ‹نباید کاری کنی که به آبروی خانواده خدشه‌ای وارد شود: نابێ کارێ بکەی ئابرووی بنەماڵە رووشەیەک هەلگرێ›.

**خدشه‌دار** / xadšedār/: [عربی/ فارسی] *صفت.* رووشار؛ رووشەدار؛ گەزنگاز؛ زەرەرمەند ‹نباید شخصیت کسی خدشه‌دار بشود: نابێ کەسایەتی کەسێک رووشار بێت›.

**خدعه** / xod'e ، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] کەڵەک؛ تەڵەکە؛ فێڵ؛ گزی؛ گەڕ؛ هەنگ؛ پاختە؛ ڤێلک؛ لێپ؛ ڕێوی‌فێڵ؛ ڕێوی‌بازی؛ ڕێوی‌پێچ ‹با خدعه و نیرنگ توانست استخدام شود: بە گەڕ و گوڕ توانی دابمەرزێ›.

**خدم** / xadam/: [عربی] جمعِ ☜ **خادم**

**خدمات** / xadamāt/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **خدمت** ۲. خزمەتکاری؛ چالاکی ئابووری بە ئامانجی جێبەجێ کردنی کاروباری دیتران (وەک ڕاگواستن، بە شینەوە و فرۆشتنی کالا، ڕاهێنان و بارهێنان، دەرمان و...).

**خدمات‌رسانی** / xadamātresānî/: [عربی/ فارسی]/اسم. ڕاژەکاری؛ کار و ڕەوتی خزمەت و یارمەتی کەسێ یان جێگایێک ‹خدمات‌رسانی بە روستاییها باید شتاب بیشتری بگیرد: ڕاژەکاری بۆ گوندنشینان دەبێ خێراتر بێ›.

**خدماتی** / xadamātî/: [عربی] صفت. ڕاژەیی؛ پێوەندیدار یان سەربە ڕاژە.

**خدمت** / xedmat ، ـها؛ خدمات/: [عربی]/اسم. خزمەت؛ خەمەت؛ خەومەت؛ خەڵمەت: ۱. ڕاژە؛ کارێ کە قازانجی بۆ دیترانە ‹او بە تو خدمت بزرگی کرد: ئەو خزمەتێکی گەورەی پێت کرد› ۲. خزمەتی مەزرینگەیی؛ کاری دەوڵەتی ‹ویژەی خدمت: تایبەتی خزمەت› ۳. سەربازی ۴. ئاسانە؛ بارەگا؛ لا ‹سلام بندە را خدمت ایشان برسان: سلاوی من بگەینە خزمەتیان›.

▣ **خدمت زیر پرچم/ وظیفه:** سەربازی؛ بێگاری؛ خزمەت سەربازی.

▣ **خدمت کردن:** خزمەت کردن؛ کەل‌گرتن؛ بۆ کەسێ یان لە شوێنێک کارکردن.

**خدمت کسی را کردن:** کاروباری کەسێ جێبەجێ کردن؛ بۆ کەسێ کارکردن؛ بەردەستی کەسێ کردن.

**خدمت کسی رسیدن:** ۱. ☜ **به خدمت کسی رفتن** ۲. [کنایی] چاری کەسێ‌کردن؛ بە داو کەسێک‌گەیین؛ بە دەور کەسێکا هاتن؛ بە خزمەت کەسێک گەیشتن؛ کەسێک تەمێ‌کردن ‹عیب ندارد خدمت تو هم می‌رسم: قەیدی نیە، چاری تۆش دەکەم›.

**به خدمت کسی خاتمه دادن:** کەسێ وەدەرنان؛ کەسێ لە سەر کارەکەیەوە دەرکردن.

**به خدمت کسی رفتن:** چوونە خزمەت کەسێ؛ بۆ لای کەسێکی بەڕێز یان پایەبڵند ڕۆیشتن: **خدمت کسی رسیدن**

**در خدمت کسی بودن:** لە خزمەت کەسێکدا بوون: ۱. ئامادە بوون بۆ خزمەت‌کردن ‹بنده در خدمت هستم، هر امری دارید، بفرمایید: ئەمن لە خزمەتدام، هەر کارێک هەیە، فەرموون› ۲. بە لای کەسێکی بەڕێزەوە بوون ‹دیروز در خدمت آقای وزیر بودم: دوێنێ لە خزمەتی جەنابی وەزیردا بووم›.

**خدمتانه** / xedmatāne/: [عربی/ فارسی]/اسم. دەسخۆشانە؛ خزمەتانە؛ ڕێزانە یان پاداشی خزمەتێکی دیاریکراو ‹سرکار! نامە را برسان و خدمتانه‌ات را بگیر: سەرکار! نامەکە بگەیێنە و دەسخۆشانەت وەرگرە›.

**خدمتکار** / xedmatkār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. خزمەتکار؛ خدمەتکار: ۱. خزمەتچی؛ هەژمە؛ مەرڤ؛ خولام؛ خوبزە؛ نۆکەر؛ کورتێلۆ؛ کەسێ کە لە هەمبەر وەرگرتنی مز یان شتێک لە ماڵێکدا کار دەکا ۲. بەردەس؛ بەردەست؛ پێشخزمەت؛ ژێردەست.

**خدمتگزار** / xedmātgozār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. خزمەتکار: ۱. کەسێ کە لە مەزرینگەیەکی دەوڵەتیدا، لە ژێر چاودێری کارگێڕەوە کار دەکا (وەک بەردەست، نواوان، باخەوان؛ ئاودارچی، شۆفێر و...) ۲. کەسێ کە بە بێ مز، یارمەتی دیتران دەدا و خزمەتیان دەکا ۳. هەژمە؛ مەرڤ؛ خزمەتچی.

**خدمتگزاری** / xedmatgozārî/: [عربی/ فارسی]

/اسم. خزمەتکاری: ۱. کاری خزمەتکار ۲. هەژمەیی؛ نۆکەری؛ کار یان ڕەوتی خزمەت کردن و یارمەتی دان بە دیتران.

**خدم‌وحشم** / xadam-o-hašam/: [عربی]/اسم. [مجازی] دەست و پەیوەند؛ دەست و پێ؛ ژێردەستان؛ خزمەتکارانی جۆرواجۆری نێوماڵی کە نیشانەی دەوڵەمەندی و شکۆیە ‹او زمانی برای خودش کلی خدم و حشم داشت: سەردەمانێک بۆ خۆی گەلێک دەست و پەیوەندی هەبوو›.

**خدمه** / xadame/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **خادم** ۲. خزمەتکاران؛ کۆی کارکەرانی دەزگا یان ماشینێک ‹خدمەی هواپیما: خزمەتکارانی فڕۆکە›.

**خدنگ**[1] / xadang/: اسم. خەدەنگ: ۱. دارێکی پتەو و گورخ کە تیر و ڕمی لێ چێدەکەن ۲. تیرێ کە لە چێوی داری وا دروست کراوە ۳. ڕسق؛ بانبانک؛ جانەوەرێکی لە تیرەی سمۆرە و هێندێک بچووکتر

**خدنگ**[2]: صفت. [ادبی] ڕێک؛ ڕاست و پتەو؛ ڕاست و ڕەختە ‹قامت خدنگ: بەژنی ڕێک›.

**خدو** / xadû/: اسم. [ادبی] گلۆیز؛ گلیز؛ تف؛ ئاوی دەم کە فڕێ بدرێ.

**خدوم** / xadûm/: [عربی] صفت. [ادبی] خزمەتی؛ خاوەنی خوو و خدەی خزمەت‌کردن.

**خدیو** / xadîv، ـان/: اسم. [ادبی] ۱. پاوشا؛ پادشا؛ پاتشا؛ پاشا ۲. سەرۆک؛ فەرمانڕەوا؛ میر؛ ئەمیر ۳. [قدیمی] خودا؛ خوا؛ خودێ؛ خولا.

**خذلان** / xezlān/: [عربی] اسم. [ادبی] ۱. سووکی؛ سۆکی؛ پەستی؛ نزمی ۲. داماوی؛ لێکەوتوویی؛ قوڕەماوی؛ لێقەوماوی.

**خر**[1] / xar، ـها؛ ـان/: اسم. کەر؛ هەر؛ خەر؛ کەهر: ۱. ولاخ؛ گوێدرێژ؛ گویرێژ؛ گۆهدرێژ؛ بەنەری؛ گیانەوەری گوهانداری چوارپێی کەوی، لە تیرەی ئەسپان کە بۆ هەڵگرتن و ڕاگواستنەوە و سواری کەڵکی لێ وەردەگیرێ، سەر زل، گوێ درێژ، کولک و کلک کورتە و لە هەر پادا یەک ئەنگوست و یەک سمی هەیە ۲. [کنایی] ساویلکە سایلۆح؛ مرۆی سەرسەری و بێ ئاوەز.

▣ **خر دجال**: [فرهنگ‌مردم] کەر جەجاڵ؛ کەرێ کە دەڵێن دەجاڵ لە کاتی سەرهەڵدانیدا سواری دەبێ و لە هەر تالە موویەکی دەنگێ دەبێتەوە و...

**خر دیزه**: کەر دێزی؛ کەر دێزگ؛ کەرە دێزە؛ ڕەگەزێ لە کەر بە ڕەنگی خۆڵەمێشی، ناوی دەرکردووە بەوەی کە بۆ زیانی خاوەنەکەی ئامادەیە بتۆپێ.

▣ **خر آوردن و معرکه بار کردن**: [مجازی] بار و کەر لە قوڕ دەرکردن؛ تووشیاری دەردیسەر و زەحمەتی زۆر بوون ‹وقتی با این خانواده وصلت کردی، آن وقت خر بیاور و معرکه بار کن!: کاتێ چوویتە نێو ئەم بنەماڵەوە، ئەوسا وەرە لەم قوڕە دەرکە ئەم کەرە!›.

**خر خود را از پل گذراندن**: [کنایی] بەرد نانە سەر مەڵۆی خۆ؛ بار خۆ نانە بارخانەوە؛ لە بوار پەڕینەوە؛ بە ئامانجی خۆ گەیشتن.

**خر خود را راندن**: [کنایی] گوێ لە مەشکەی خۆ بوون؛ کرد و کۆ هەر بۆ خۆ بوون؛ تەنیا لە بیری خۆدا بوون؛ تەنیا ئاوڕ لە خۆ دانەوە ‹آقا جان! تو خر خودت را بران و کاری بە کار ما نداشتە باش: کاکە گیان! با گوێت لە مەشکەی خۆت بێ و کارت بە کاری ئێمەوە نەبێ›.

**خر دادن و خرما گرفتن**: [تعریض] کەر بە کۆپان دان؛ ڕۆن هێنان و ئاو بردن، مامەڵە و ئاڵ و وێری نارێک و بەڕواڵەت باش کردن ‹ویلا فروختن و ماشین خریدن تو حکایت خر دادن و خرما گرفتن است: ماڵ فرۆتن و ماشێن سەندنی تۆ، نەقڵی کەر بە کۆپان دانە›.

**خر داغ کردن**: [تعریض] کەر داخ کردن بە کەباب برژاندن زانین؛ شتێکی خۆش نەبوون و دڵی خۆ بێ‌هۆ پێی‌خۆش کردن.

**خر را گم کردن و دنبال پالانش گشتن:** *[کنایی]* گوێرەکە گوم کردن و لە گوێرەوسار گەڕان؛ لە کاری گرینگ و سەرەکی دەست بەردان و کەوتنە دووی وردەکاری بێ بایەخەوە.

**خر رنگ کردن:** چۆلەکە ڕەنگ کردن؛ مێش لێ کردنە گامێش؛ خەڵکی سادە و ساویلکە فریو دان ‹اینها کاسب نیستند، خر رنگ می‌کنند: ئەمانە کاسبکار نین، چۆلەکە ڕەنگ ئەکەن›.

**خر شدن:** *[مجازی]* کەر بوون: ١. عەقڵ لێ سنیان؛ عەقڵ گۆڕیان؛ فریو خواردن و هەڵخڵەتیان ‹به حرف بنگاهی خر شدم و این خانه خراب شده را خریدم: بە قسەی بنکەوانەکە کەر بووم و ئەم کاول بووەم کڕی› ٢. گەوجی کردن؛ کەری کردن؛ کاری گەوجانەکردن ‹خر شد به این آدم لات شوهر کرد: کەر بوو، مێردی کرد بەم کابرا لاتە›.

**خر کردن:** *[مجازی]* کەرکردن؛ هەڵخڵەتاندن؛ عەقڵ لێ سەندن؛ فریو دان و بە کارێ هەڵخڕاندن ‹با زبان چرب او را خر کرد و به کار کشید: بە زوانێکی تەڕ کەری کرد و کێشایە بن کار›.

**خر کریم را نعل کردن:** *[کنایی]* ژێر سمێڵی دان؛ سمێڵ چەورکردن؛ بەرتیل دان ‹آخرش مجبور شد خر کریم را نعل کند، تا کارش بگذرد: دوایی چاری نەما ژێرسمێلی بدا، تا کارەکەی جێبەجێ بێ›.

**خر (کسی) از پل گذشتن:** *[کنایی]* لە ئاو پەڕینەوە؛ بە مەبەستی خۆ گەیشتن ‹تا رییس شد و خرش از پل گذشت، دوستان را فراموش کرد: هەر بووە سەرۆک و لە ئاو پەڕیەوە، هەڤالانی لە بیر کرد›.

**خر کسی از کرّگی دم نداشتن:** *[کنایی]* چاو لە مافی خۆ نووقاندن.

**خر کسی رفتن:** *[مجازی]* گا بە دەنگی کەسێ چوون؛ بە گەز و ڕەی کەسێ پێوان؛ قسەی کەسێک بە برەو بوون؛ خاوەن کارتێکەری و برشت هەبوون ‹توی اداره خرش می‌رود: لە نێو مەزرینگەدا قسەی برەوی هەیە›.

**خر گیر آوردن (کسی را):** *[مجازی]* کەر گیر هێنان؛ کەر خۆ دەسکەوتن؛ کەسێک بە کەر زانین؛ کەسێ بە گێل و گەوج زانین و بە تەمای فریودانی بوون ‹او را خر گیر آورده بودند و ماشین قراضه‌شان را به نافش بستند: کەریان گیر هێنابوو ماشینە شەق و شڕەکەیان کردە ملی›.

**از خر شیطان پایین آمدن:** *[مجازی]* لە کۆڵ شەیتان دابەزین؛ لە کلک شەیتان دابەزین؛ لە کەللەڕەقی دەس هەڵگرتن ‹هر کاری کردیم از خر شیطان پایین نیامد و سر حرفش ایستاد: هەرچیەکمان کرد لە کۆڵ شەیتان دانەبەزی و لە سەر قسەی خوەی پێی داکوتا›.

**بر خر مراد سوار شدن:** *[مجازی]* گای خۆ دیتن بە دۆڵەوە؛ بە کۆڵ مرادەوە بوون؛ بە کام و نیازی خۆ گەیشتن ‹فعلا که منیژه خانم بر خر مراد سوار است: جارێ خۆ مەنیژە خان گای خۆی دیوە بە دۆڵەوە›.

**مثل خر در گل ماندن** ☜ **مثل**

**مغز خر خوردن** ☜ **مغز**

**خر-**[۲]: *پیشوازه.* کەر- : ١. گا- ؛ کەرە- ؛ کەڵە- ؛ خەر- ؛ خەرە- ؛ زل؛ گەپ؛ درشت؛ گەورە ‹خرسنگ؛ خرچنگ؛ خرمهره؛ خرمگس: گابەرد؛ کەرژنگ؛ خەرموورگ؛ خەرەنگەزە› ٢. فرە؛ زۆر؛ گەلەک ‹خر زور: کەرزۆر›.

**-خر**[۳]: *پیواژه.* - سێن؛ - سان؛ -کڕ؛ کڕیار و سێنەر ‹گوسفندخر: مەڕسێن›.

**خر** /xer/: *اسم. [گفتاری]* دەرناق؛ ناق.

▣ **خر کسی را چسبیدن/ گرفتن:** *[کنایی]* بەرۆک/ بەرەک/ بینەقاقە/ ناق کەسێ گرتن؛ پشوو/ تەنگ بە کەسێ هەڵچنین؛ دریا بە کەسێ‌گرتن؛ بەرەکەو یۆی گێرتەی: ١. بە کەسێکەوە هەڵپێچان؛ کەسێ بە تەنگەوە

هێنان ‹فردا نیایی خر مرا بچسبی که زود باش پول بده!: سبەینێ نەییت بەرۆکم بگری و بڵێی زووبە پارەبدە!› ٢. تاوانێ نانە مل کەسێ ‹هر وقت در محله دزدی می‌شد، خر او را می‌چسبیدند: هەر کاتێ لە کۆڵانەکەدا دزی دەکرا، بەرەکی ئەویان دەگرت›.

**خراب** / xarāb/: [عربی] *صفت.* ١. خراب؛ خراپ؛ خراو؛ خرا؛ شێواو؛ شێویاگ؛ بەبێ پێکهاتەی ئاسایی یان دوزەنەی سروشتی پێشوو ‹ماشین خراب: ماشینی خراپ› ٢. ئارۆفتە؛ ئارەفتە؛ کاول؛ کەل‌کوور؛ ویران؛ بێ‌ئاوەدانی ‹خانەی خراب: ماڵی کاول› ٣. /ـها/ خراو؛ خراپ؛ گەنیو یان دارزاو ‹میوەی خراب: میوەی خراو› ٤. خراو؛ تووش؛ ناخۆش ‹هوای خراب: هەوای تووش›. هەروەها: **خراب بودن؛ خراب شدن؛ خراب کردن** ٥. *[مجازی]* ڕەشەمەس؛ مەستی کەلەلا؛ تەلەس؛ زەمر؛ گیز؛ شەشدانگ مەست ٦. خراپ؛ ناوزڕاو؛ بەدناو ‹خودش را عین زنهای خراب درآورده بود: خۆی ڕاست وەکوو ژنە خراپەکان لێ کردبوو›.

**خرابات** / xarābāt/: [عربی] /*اسم.* ١. *[قدیمی]* مەیخانە؛ شەراوخانە؛ بادەخانە ٢. خەرابات؛ شوێنێ کە تێیدا سەر دەکەنە بەنگ و بادە و تێکەڵی‌کردن لە گەڵ ژنانی خراپکاردا.

**خراباتی** / xarābātî/: [عربی] *صفت.* خەراباتی: ١. خولیای خەرابات ٢. هۆگری مەیخانە.

**خرابکار**[1] / xarābkār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /*اسم.* کەسێ کە بە نهێنی پەلاماری دامەزراوەی دژمن ئەدا.

**خرابکار**[2]: *صفت.* گەنەکار؛ خراوکار؛ خاوەنی تایبەتمەندی یان خوو و خدەی زەرەر گەیاندن یان تێکدان ‹این بچه خیلی خرابکار است: ئەم منداڵە زۆر گەنەکارە›.

**خرابکارانه** / xarābkārāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* تێکدەرانە؛ گەنەکارانە؛ بە بار و دۆخی تێکدەریەوە ‹حملەی خرابکارانە: پەلاماری تێکدەرانە›.

**خرابکاری** / xarābkārî/: [عربی/ فارسی] /*اسم.* تێکدەری؛ گەنەکاری؛ کار یان ئاکارێ کە دەبێتە هۆی تێکچوون و خراو بوونی شتێ.

**خرابه**[1] / xarābe ، ـها/: [عربی/ فارسی] /*اسم.* کەلاوە؛ کاولە؛ کەلار؛ کەلاوەکۆن؛ کاولەکۆن؛ وێرانە؛ شوێنی وێران ‹شب را در خرابه‌ای خوابید: شەو لە کەلاوەیەکدا نووست›.

**خرابه**[2]: *صفت.* کاول؛ کەلاوە؛ وێران؛ کاز؛ کاولە؛ کەلکە خراوە؛ قۆختە؛ کەل‌خرۆوە ‹از مال دنیا برایش خانه خرابه‌ای مانده: لە ماڵی دنیا ماڵە کاولێکی بۆ بەجێ ماوە›.

**خرابی** / xarābî/: [عربی] /*اسم.* ١. کاولی؛ وێرانی ‹سیل باعث خرابی صدها خانه و مغازه شد: لافاو بووە هۆی کاولی سەدان ماڵ و دووکان› ٢. خراپی ‹آفتهای کشاورزی موجب خرابی محصول می‌شود: تەشەگەلی کشت و کاڵ دەبنە هۆی خراپی بەرهەمەکان› ٣. شپرزی؛ شڵەژاوی؛ شپرێوی؛ تێکەڵ- پێکەڵی ‹خرابی کار به خاطر نبودن مدیر توانا است: شپرزی کار هی نەبوونی بەرپرسێکی لێهاتووە›.

▣ **خرابی بارآوردن**: شپرزی بار هێنان؛ تێک و پێک دان؛ بوونە هۆی وێرانی ‹ترکیدگی لوله خرابی زیادی بار آورد: ترەکاوی لوولە شپرزیەکی زۆری بار هینا›.

**خراج** / xarāc ، ـها/: [معرب از پهلوی] /*اسم.* *[قدیمی]* پیتاک؛ خەراج؛ میجبێتی؛ تەوجی؛ باربۆ؛ سەرانە؛ بەشی دەوڵەت لە داهات و دەرامەتی خەڵک.

**خراج** / xarrāc ، ـها/: [عربی] *صفت.* هەڵەخەرج؛ نەزان خەرج؛ دەسبا؛ قەللاش.

**خراجگزار** / xarācgozār/: [معرب/ فارسی] *صفت.* پیتاکدەر؛ باجدەر.

**خرازی** / xar(r)āzî ، ـها/: /*اسم.* ١. وردەواڵە فرۆش؛ کەسێ کە شت‌ومەکی ئاڕایشت، گۆرەوا،

دەسماڵ و شتی وا دەفرۆشێ ۲. وردەواڵە فرۆشی؛ دووکانێ کە تێیدا ئاوەها کاڵاگەلێ دەفرۆشن.

**خراس** / xarās ، ـها/: *اسم. [قدیمی]* ۱. ئاشەچاروا؛ ئاشێ کە بە هێزی چاروا، بە تایبەت کەر دەگەڕێ ۲. *[مجازی]* ئاسمان؛ ئەزمان.

**خراش**[1] / xarāš ، ـها/: *اسم.* رووش؛ ڕیش؛ ڕویش؛ روویس؛ ڕوویش؛ ڕووشا؛ ڕۆش؛ ڕووشە؛ خاشە؛ کیر؛ کیڕ؛ شاخ؛ قرنج؛ مەرت؛ ڕووک؛ ڕووکە؛ شوێنەوارێ کە لە کێشرانی شتێکی تیژ بە سەر ڕوویەکدا بەدی دێ ‹خراش کوچکی روی گونەاش به چشم می‌خورد: رووشێکی گچکە لە سەر گۆنایەوە دیار بوو›.

▣ **خراش برداشتن:** ڕووکان؛ ڕووشان؛ دارووشان؛ هەڵڕووشان؛ رووش بردن؛ مەڕتان؛ ڕووکیان؛ ڕووکەدار بوون؛ ڕیش بیەی؛ شوێنەواری ڕووکاوی بە ڕووی شتێکەوە دەرکەوتن ‹دستم خراش برداشت: دەستم رووکیا›.

**خراش دادن:** ڕووکاندن؛ ڕووشاندن؛ کیراندن؛ مەڕتاندن؛ سەلخین؛ کەلداچۆن؛ ڕنیەی.

**خراش یافتن:** ڕووشان؛ ڕووکیان؛ رووش بردن؛ خاشەدار بوون.

**- خراش**[2]: *پیوازە.* - ڕووشێن؛ -کرێن؛ - ڕووکێن؛ - مەڕتێن؛ - سەلخێن ‹جگر خراش: جەرگ رووشێن›.

**خراشاندن** / xarāšāndan/: *مصدر. متعدی. [نامتداول]* ڕووشاندن؛ ڕووکاندن؛ مەڕتاندن؛ سەلخاندن؛ کیراندن؛ ڕنین.

■ صفت فاعلی: **خراشاننده** (ڕووشێنەر)/ مصدر منفی: **نخراشاندن** (نەڕووشاندن)

**خراشیدگی** / xarāšîdegî ، ـها/: *اسم.* ڕووشاوی؛ کێرپاگی؛ ڕووکاوی؛ مەڕتاوی؛ سەلخاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕووشان ‹بر روی گونەهایش جای خراشیدگی مشاهده می‌شود: لە سەر کولمانیەوە شوێنی رووشاوی دەبیندرێ›.

**خراشیدن** / xarāšîdan/: *مصدر. متعدی.* **خراشیدی:** ڕووشاندت؛ **می خراشی:** دەڕووشێنی؛ **بخراش:** بڕووشێنە// ڕووشاندن؛ ڕوویشاندن؛ ڕووکاندن؛ ڕووکانن؛ مەڕتاندن؛ سەلخاندن؛ شەقتین؛ ڕنین؛ ڕنیەی؛ ڕەندش؛ ڕێش/ ڕیش کەردەی؛ شاخ کردن؛ چیخ کرن؛ بە ڕووی شتێکدا بە ئامرازێکی تیژ شوێنەوارێ دانان و پێی زیان گەیاندن. هەروەها: **خراشیدنی**

■ صفت فاعلی: **خراشنده** (ڕووشەر)/ صفت مفعولی: **خراشیده** (ڕووشاو)/ مصدر منفی: **نخراشیدن** (نەڕووشان)

**خراط** / xarrāt ، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم.* سدان؛ خەڕات؛ کەسێ قاپ و ئامانی داری و... بە سووڕدان و تاشینی چێو چێ دەکا.

**خراطی** / xarrātî/: [عربی]/*اسم.* خەڕاتی: ۱. کاری خەڕات؛ کار یان زانیاری دروست کردنی شتی جۆراوجۆر بە سووڕدان و داتاشینی چێو ۲. /ـها/ کارگەی سدان.

**خرافات** / xorāfāt/: [عربی] جمعِ ☜ **خرافه**

**خرافاتی** / xorāfātî/: [عربی] *صفت.* ۱. کۆنەپەرستانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە کۆنەپەرستیەوە ‹باورهای خرافاتی: بیر و باوەڕی کۆنەپەرستانە› ۲. /ـها/ کۆنەپەرست ‹مردم خرافاتی: خەڵکی کۆنەپەرست› ❊ **خرافی**

**خرافه** / xorāfe ، ـها؛ خرافات/: [عربی]/*اسم.* کۆنەپەرەستی؛ کۆنەپەرستی؛ کردەوە یان باوەڕی سەرچاوەگرتوو لە نەزانی، هیوا بە جادوو، ترس لەوەی کە نەناسراوە و...

**خرافه‌پرست** / xorāfeparast ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* کۆنەپەرست؛ خاوەنی باوەڕ بە شتی پڕ و پووچ.

**خرافی** / xorāfî/: [عربی] ☜ **خرفاتی**

**خرام**[1] / xarām/: *اسم. [ادبی]* خنچکە؛ خلنگ؛ شەلەنگی؛ گومەتە؛ کاکشیر؛ لەنجە؛ نازە ناز؛ لارە؛ لار و لەنجە؛ لەنجەلەنج؛ بە ناز؛ چەم و

خەم؛ کردە یان ڕەوتی لەنجەکردن.

**ـخرام**[2]: *پیواژه. [ادبی]* ــ خلنگ؛ ـ چەلەنگ؛ ــ لەنجە؛ــ گومەتە؛ــخەرام ‹خوشخرام: خۆش‌خلنگ›.

**خرامان**[1] / xarāmān/: *صفت. [ادبی]* خەرامان؛ شەلەنگ؛ بە خەمزە؛ بە لەنجە؛ شل‌ومل؛ بە لەنجە و لار؛ لاوی قەد باریک و پێکەوتوو ‹سرو خرامان: سەولی خەرامان›.

**خرامان**[2]: *قید.* بە لەنجە و لارە؛ بە لەنجە و لار؛ خەرامان؛ چەلەنگ ‹خرامان می‌رفت: دەڕۆیی بە لەنجە و لارە›.

**خرامیدن** / xarāmîdan/: *مصدر. لازم.* //**خرامیدی**: خلنگایت؛ **می خرامی**: دەخلنگی؛ **بخرام**: بخلنگە// خلنگین؛ لەنجان؛ بەناز ڕۆیشتن؛ لەنجەکردن؛ ڕێگە چوونی بە ئەسپایی و ورد.

■ صفت فاعلی: **خرامنده** (ــ)/ صفت مفعولی: **خرامیده** (خلنگاو)/ مصدر منفی: **نخرامیدن** (نەخلنگان)

**خربازار** / xarbāzār/: *اسم. [کنایی]* کەربازاڕ؛ خلوو؛ هەلا و پەلا؛ جێگای قەرەباڵغ و بێ‌سەرە و بەرە ‹نمی‌دانی چه خربازاری بود! سگ صاحبش را نمی‌شناخت: نازانی چ کەربازاڕێ بوو! کەس کەسی نەدەناسی›.

**خربزه** / xarboze، ـها/: *اسم.* کالەک؛ کارەک؛ هەربزە؛ خەرڤیزە؛ قەرپوز؛ قارپوز؛ قاون؛ تولە؛ گوندۆڕ؛ گوندۆرە: ١. گیایێکی پنچکی لە تیرەی خەیار، بە لق و پۆپی کێشراو بەسەر زەویدا، بە گەڵای پێنج‌بەشی و گوڵی زەردەوە ٢. بەری ئەو گیایە کە میوەیەکی گەورە و زۆرتر هێلکەیی یان خڕە و پێستی ئەستوور و ناوەی شیرین و ئاودارە: **خربوزه**

**خربق** / xarbaq، ـها/: [عربی]/*اسم.* سیاداری؛ سیاوەچاو؛ سیاچاوە؛ گیاقاولەمە؛ خەربەند؛ ڕوەکێکی لە تیرەی هەلالانە، بە ڕیشەی باریک، لاسکی چەماوە و گەڵای درێژ و پەڕەگوڵی ڕێک‌وپێکی سوورەوە، کە لە کۆتایی زستان یان سەرەتای بەهاردا دەپشکوێت.

**خربوزه** / xarbûze/ ☜ **خَربُزه**

**خرپا** / xarpā، ـها/: *اسم.* خەرپا؛ پێکهاتەیێک لە مێلە یان تیرگەلی ئاسنی، چێوی یان سیمانی، پتر بە بیچمی سێ‌گۆش کە بۆ دروستکردنی میچی هەراو (وەکوو پرد، هەمار و هێلانەی فڕۆکە) بەکار دێ.

**خرپشته** / xarpošte، ـها/: *اسم.* ١. قۆرت؛ قۆسپە؛ کۆسپ؛ قوتکە؛ گەردۆڵکە؛ پشتەماسی؛ بەرزی و قۆقزی کە لە جێگایەک بە شێوەی سروشتی یان دەسکرد بەدیهاتبێ ٢. هەورەبان؛ کۆماج؛ شوو؛ خەرپشتە؛ خەرپشت؛ خانووچکەیێ کە لە سەر پلیکانی سەر بان دەیکەنەوە ٣. *[قدیمی]* تاوڵ؛ ڕەشماڵ.

**خرپول** / xarpûl، ـها/: *صفت. [تعریض]* کەرپووڵ؛ بووودە؛ هەرە دەوڵەمەن؛ زۆر دەوڵەمەند ‹می‌گشت یک خانواده‌ی خرپول پیدا کند، خودش را ببندد به ریششان: بە دووی بنەماڵەیێکی کەرپووڵدا دەگەڕا خۆی بە سەریاندا بسەپێنێ›.

**خرت‌ـخرت** / xertxert/: *صوت.* خرمەخرم؛ کرمەکرم؛ دەنگی هاڕین یان جاویانی شتێکی تورت ‹قند را گذاشت توی دهانش و خرت‌ـخرت جوید: قەنەکەی نایە زاری و خرمەخرم خواردی›.

**خرت‌وپرت** / xert-o-pert، ـها/: *اسم.* خڕە و پڕە؛ شڕە و پڕە؛ شڕەبڕە؛ شڕ و شاتاڵ؛ شڕ و تاڵ؛ پڕتاڵ؛ خرت و پرت؛ کرت مرت؛ وردی‌مردی؛ وردی‌مرد؛ وردەمردە؛ وردە ئەسپاب؛ لاچۆ پاچۆ؛ کەلپەل؛ کەلمەل؛ شنگر و شیواڵ؛ شەخەل و مەخەل؛ چەک و پووش؛ چەک و چووڵ؛ کولومول؛ هوورمورر؛ کۆمەڵەی شتومەکی جۆراوجۆر کە شپرز لە شوێنێ داکەوتبێ ‹چقدر خرت و پرت دور خودت تلنبار کرده‌ای!: چەندە خڕە و پڕەت بە دەوری خۆتدا کەڵەکە کردووە!›.

**خرتوخر** / xartûxar/: *صفت. [گفتاری]* هەرچی و

پەرچی؛ کەس‌لەکەس؛ گورگوتاو؛ کەس-کەس؛ گاشە؛ بێ‌سەرە و بەرە؛ گورمۆرە؛ تەڕا و بەڕا؛ گژۆ-مژۆ؛ کەربازاڕ ‹شرکت چنان خرتوخری شده که بیا و ببین!: دابەشگە بووەتە هەرچی و پەرچیەک مەپرسە!›.

**خرتوخری** / xartûxarî /: اسم. [گفتاری] کەربازاڕی؛ کەس‌لەکەسی؛ گورمۆرەیی؛ شلووق و بێ‌سەر و بەرەیی ‹خیلیها از همین خرتوخری نان می‌خورند: زۆرێک هەر لەم کەربازاریە تیکە ئەگلێنن›.

**خرج** / xarc ، ـها/: [عربی] اسم. خەرج: ۱. مەزێخ؛ مەزیخ؛ مەزاخ؛ مەزخ؛ بەخت ‹خرج تحصیل: خەرجی خوێندن› ۲. تێز؛ بازووت؛ دەرمان؛ بارە؛ تەقەمەنیەک کە بۆ هاویشتنی گولە یان مووشەک و... بە کار دەڕوا.

▣ **خرج آتینا:** [گفتاری] چۆنیەتی پارە بەبا دان؛ مەزاخی لەخۆڕا؛ خەرجی بێ‌جێ؛ پارە چوون بە هەڵەخەرجی و خۆشگوزەرانی ‹هر چه درآوردی همه را خرج آتینا کردی: هەرچێکت دەرێنا هەموویت بەبا دا›.

**خرج راه:** خەرجی ڕێگە؛ خەرجی ڕێ ‹یک هفته برو پیش عمویت، خرج راه با من: حەفتەیێک برۆ بۆ لای مامت، خەرجی ڕێگەت لە سەر من›.

**خرج سفره:** پارەیێک ـجگە لە مووچەـ کە بۆ میوانداری‌کردن بە برێ لە کاربەدەستان دەدرێ.

▣ **خرج بالا آوردن:** خەرج دروست‌کردن ‹ماشینم چپ شد و کلی خرج بالا آورد: ماشێنەکەم چەپە بوو، خەرجێکی زۆری بۆم دروست کرد›.

**خرج برداشتن/ داشتن:** خەرج هەڵگرتن؛ خەرج تێچوون؛ تێچوون ‹مهمانی دیروز خرج زیادی برداشت: میوانیەکەی دوێنێ خەرجی زۆری هەڵگرت›.

**خرج تراشیدن:** مەزێخ خستنە مل؛ خەرج کردنە کۆڵ؛ خەرج تاواندنەوە؛ خەرج تاشین؛ خەرجی ناڕەوا و هەڵبەستە پێک هێنان ‹هر روز یک جور خرج می‌تراشید و از من پول می‌گرفت: هەر ڕۆژێ بە جۆرێ مەزێخی دەخستە ملم و پارەی لێ دەستاندم›.

**خرج خود را درآوردن:** خەرجی خۆ دەرهێنان: ۱. پووڵ و پارەی هەڵسووڕانی ژیانی خۆ دابین‌کردن ‹پسر بزرگم خرج خودش را درمی‌اورد: کوڕە گەورەکەم خەرجی خۆی دەردێنێ› ۲. پارەی دەکار چوو لە کاتی فرۆشدا هێنانەوە ‹اگر این خانه را بفروشم خرج خودش را در نمی‌آورد: ئەگەر ئەم ماڵە بفرۆشم، خەرجی خۆی دەرناهێنیتەوە›.

**خرج دادن:** خەرج دان؛ نان دان؛ بۆ پاداشت و لێ بووردوویی خێر و خێرات‌کردن ‹مردی ناشناس، یک هفته خرج مردم آبادی را داد: پیاوێکی نەناسراو، حەوتوویەک خەرجی خەڵکی گوندەکەی دا›.

**خرج روی دست کسی گذاشتن:** [مجازی] خەرج دانە دەس کەسێکەوە؛ خەرج نانە سەر دەست کەسێکەوە؛ خەرج کردنە ڕیش کەسێکەوە؛ کەسێ ناچارکردن بە مەزخاندنی پارەیەک ‹عروسی کلّی خرج روی دستش گذاشت: زەماوەندەکە زۆرێک خەرجی دایە دەسیەوە›.

**خرج شدن:** خەرج بوون؛ مەزخ بوون ‹هر چه پول داشتم، خرج راه شد: هەرچی پارەم هەبوو بە ڕێگەدا خەرج بوو›.

**خرج کردن:** ۱. مەزخاندن؛ خەرج‌کردن؛ بەخت‌کردن؛ مەزاختن؛ باخت‌کردن ‹این ماه پول زیادی خرج کردی: ئەم مانگە پارەیەکی زۆرت مەزخاند› ۲. ☜ **خرج گذاشتن**

**خرج کسی کردن:** خەرجی کەسێ کردن؛ بۆ کەسێ خەرج‌کردن؛ بۆ کەسێ مەزاختن ‹پولت را خرج این و آن نکن: پارەت خەرجی ئەم و ئەو مەکە›.

**خرج گذاشتن:** خەرج کردن؛ مەزخاندن؛

مەزختین؛ خەرج‌کردنە ڕێی کەسێ یان شتێ؛ خەرج کردنە پای کەسێ/ شتێ؛ بەخت‌کـردن ‹من روی این خانه خیلی خرج گذاشتم: ئەمن بۆ ئەم ماڵە خەرجی زۆرم کرد›: **خرج کردن**

**به خرج دادن:** هێنانە کار؛ بە کار هێنان؛ دانە خەرجدا ‹خیلی حوصله بـه خـرج دادم تـا عـصبانی نشوم: گەلەک تاقەتم هێنایە کـار بەشـکوو تـووڕە نەبم›.

**به خرج کسی نرفتن:** *[مجازی]* بە گوێی هرۆڵـی کەسێکدا نەچوون؛ گوێی کەسێک بۆ شـتێک شل نەبوون ‹هرچی می‌گفتم به خرج او نمـی‌رفـت: هەرچێکم دەگوت بە گوێ هرۆلیدا نەدەچوو›.

**خرج‌تراشی** / xarctarāš ، ـهـا/: [عربی/ فارسی] *اسم.* خەرج تاواندنەوە؛ خەرج‌تاشی؛ کار و ڕەوتی بە دیهێنانی خەرجی ناپێویـست؛ بـسات نانـەوە ‹هر روز بـرایش خـرج‌تراشـی مـی‌کـرد: هـەموو ڕۆژێ خەرجێکی بۆی دەتاواندەوە›.

**خرج‌دررفتـه** / xarcdar.rafte/: [عربی/ فارسی] *قید.* خـەرجلـێ‌دەرچـوو؛ سـافی؛ بێجگەخـەرج ‹خـرج‌دررفتـه برایـت دەهـزار تومـان مـی‌مانـد: خەرجلێ‌دەرچوو دەهەزار تمەنت بۆ ئەمێنێتەوە›.

**خـــرج‌ودخـــل** / xarc-o-daxl/: [عربـی] ☜ **دخل‌وخرج**

**خرجـی** / xarcî ، ـهـا/: [عربی] *اسم.* خـەرجی: ۱. پارەیـەک کـە بـۆ بـەڕێوەبردنی کـاری ڕۆژانە بـە کەسـێ دەدرێـت ‹رفت شکایت کـرد کـە شـوهرم خرجـی نمـی‌دهـد: ڕۆی شـکاتی کـرد مێردەکـەم خـەرجی نـادا› ۲. پارەیـەک‌کـە بـۆ بـەڕێوەچوونی شـوێنێک خـەرج دەکـرێ ‹بـه این ترتیب خرجـی دولـت زیـاد مـی‌شـود!: بـەم جـۆرە خەرجی دەوڵەت زۆر دەبێتەوە!›.

**خـرجین** / xorcîn, xurcîn ، ـهـا/: [عربی] *اسم.* توربەرە: ۱. توور؛ تـووربێن؛ توورەکـە؛ تـووەرە؛ تۆمبەرە؛ تۆمۆرە؛ تیوەرە؛ هەگبـە؛ هـوڕ؛ خـۆرج؛ خـەرار؛ گواڵـە؛ گالـە؛ دنـای؛ هۆنـدراوێک بـە شێوەی دوو تای پێکەوە لکـاو کـە لـە دوو لای ئـامێری ڕاگواسـتنەوەوە (چوارپـێ، دووچەرخـە، موتـور) یـان بـە شـانەوە هەڵیدەواسـن و بـار و تۆشەی تێ دەنێن. **خورجین**

**خرچسانه** / xarčosāne/ ☜ **خرچسونه**

**خرچسونه** / xarčosûne ، ـهـا/: *اسم.* سۆنەبۆگەنە؛ سـۆنێ؛ سـنەبۆگەنە؛ مێرۆیێکـی گیـاخۆرە بـە ڕەنگـی قـاوەیی کـاڵ یـان سـەوز، ئەونـدەی قاڵـۆنچەیەک کـە لـە کـاتی هەسـت بـە مەترسـی‌کردنـدا بـۆنێکی پـیس لـە خۆیـەوە دەداتەوە: **خرچسانه؛ کَوَز**

**خرچنـگ** / xarčang/: *اسم.* قرژانـگ؛ قـرژاڵ؛ قـرژاڵ؛ قارژنـگ؛ قـاژنگی؛ قاژنـگ؛ قـەرژنگ؛ قرژنگ؛ کەرژنگ؛ کەرکنج؛ خـەرکنج؛ کێفـژاڵ؛ کیفزاڵ؛ کیـڤژاڵە؛ گیـژاڵ؛ کیفـشینگ؛ چنگـار: ۱. /ـهـا/ گیانـەوەرێک بـە دوو چـاوی قیـت و دەرپـەڕیو، قـاپی پـان و ڕەق و یـەک یـان دوو جـووت شـەویلاکەوە ۲. *[نجـوم]* وێنەیـەکی ئاسمانی چکۆلە: **سرطان**

▣ **خرچنگ آب‌شیرین** ☜ **خرچنگ دراز**

**خرچنگ پهن:** قرژاڵی خڕ؛ جـۆرێ قـرژاڵ لـە ڕاسەی دەپێیان، بە شاخیلەی درێژەوە.

**خرچنگ دراز:** قرژاڵی درێژ؛ چەشـنێ قرژاڵـە بـە قـاپێکی درێژۆکـەی یەکپارچـە و لەشـی پێکهاتوو لە سەر و سینگ و سکی گرێ‌-گرێ کە قاپێـک سـەر و سـینگی داپۆشـیوە. ئـەم چەشنە قرژاڵـە ئەگـەر ئەنـدامێکی داکـەوێ، دەردێتـەوە و ساڵـیک چەنـد جـار هاوکـات لەگەڵ گەشکەکردنیدا پێست دەخا: **خرچنگ آب‌شیرین**

**خرچنگ راهب** ☜ **خرچنگ منزوی**

**خرچنگ شاهی** ☜ **خرچنگ نعلی**

**خرچنگ صدف‌نشین** ☜ **خرچنگ منزوی**

**خرچنگ عنکبـوتی:** قرژانگـی جالجالـۆکەیی؛ چەشنێ قرژانگ لە ڕاستەی دەپێیان، بە پـای

درێژەوە.

**خرچنگ منزوی:** چەشنێ قرژانگ لە ڕاستەی دەپێیان، بە لەشێکی درێژ و پتەوەوە کە زۆرتر لە قاپلۆخی هرۆلی شەیتانۆکەدا دەژێ:

**خرچنگ صدف‌نشین؛ خرچنگ راهب**

**خرچنگ نعلی:** جۆرێ گیانەوەری زەریاژی بە سەرسنگی پێکەوەنووساو، کاسەسنگی کەوانی لە چەشنی نالی ئەسپ بە ڕەنگی قاوەیی بریقەدار، جووتێ چاوی سادە، جووتێ چاوی لێکدراو و شەش‌جووت پێیەوە:

**خرچنگ شاهی**

**خرحمالی** / xarhammālî ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم. [تعریض]* کەرژالی؛ کاری کەرەکی؛ کاری دژوار و بێ‌کەڵک یان کەم داهات ‹هرچه خرحمالی است می‌گذارند بە عهدەی من: هەرچی کەرژالییە بە کۆڵی منیدا دەدەن›.

**خرخاکی** / xarxākî ، ـها/: *اسم.* خلێرە؛ خەرخودا؛ داپیرۆشک؛ داپیرۆکە؛ پیرێژنۆکە؛ پیرایشۆکە؛ پیرۆشک؛ مامەخۆڵینە؛ پوراشێوکە؛ شەگورگانە؛ تیتگەشوانە؛ هەرلە؛ جانەوەرێکی بۆر و خڕکەلە، بە لەشی ئالقە ـ ئالقە، بێ قاپوولکە و بە سکی کورت و پێی زۆرەوە، گڵ لە سەر کونەکەی هەڵدەداتەوە.

**خرـخر** / xerxer/: *صوت.* خرەـخرە؛ خرەـخڕ؛ کرەـکڕ؛ کڕـکڕ؛ دەنگێکی نزم کە لە کێشیانی شتێ بە سەر شتێکی‌تردا (وەکوو دەنگی هەسان کێشان بە سەر چێودا) بەدی دێ.

**خرـخر** / xorxor/ ☜ **خُورـخُور**

**خرخره** / xerxere/: *اسم. [گفتاری]* ناق؛ دەرناق؛ قوڕقوڕاچکە؛ قوڕقوڕاگە؛ قوڕقوڕۆچکە؛ قوڕاچکە؛ قڕقڕاچکە؛ قورتم؛ گلوەزێ؛ کش‌کشێ؛ بینەقاقە؛ هەفیک ‹خرخره‌اش را گرفته بود و ول نمی‌کرد: ناقی گرتبوو و بەری نەدەدا›.

▣ **خرخرەی کسی را جویدن:** *[مجازی]* سەر و گوێلاکی کەسێک هاڕین؛ دەم و ددان کەسێ شکاندن؛ تۆپاندن؛ بە توندی تێک هەڵچوون و لێدان ‹داشتند خرخرەی همدیگر را می‌جویدند: خەریک بوون سەر و گوێلاکی یەکتریان ئەهاڕی›.

**خرخوانی** / xarxānî ، ـها/: *اسم. [تعریض]* کەرخوێنی؛ کاری زۆر خوێندن و بەهرەی کەم بردن. هەروەها: **خرخوان**

**خرخیار** / xarxiyār ، ـها/: *اسم.* قەتک؛ قەتکەخەیار؛ خیارەدێمیلە؛ هاروێ دێمیلە؛ خەیارەمارانە؛ بنەگیایەکی لە تیرەی خەیارە بە ساقەتەی ئەستوور گەڵای سێ‌گۆش و گوڵی زەردەوە، میوەکەی لە زەیتوون درشت‌ترە و بۆ دەرمان دەبێ.

**خرد** / xerad/: *اسم. [ادبی]* ئاوەز؛ ئاقس؛ ئاوەزان؛ بیر؛ ویر؛ مژی؛ مەژگ؛ هۆش؛ عەقڵ.

**خرد** / xord/: *صفت.* ورد؛ وڕ؛ ورت؛ هورد؛ هوور؛ هۆرد؛ هیر؛ هوویر؛ هیرد؛ هویر؛ هوویرک؛ هێت؛ زمهەڕ: ١. وردیلە؛ ساوا؛ ساوە؛ ورتکە؛ وردەڵە؛ بووچکەلە؛ بچووک؛ چووکە؛ بچکەلە؛ بووچکەڵە؛ چکۆلە؛ گچکە؛ کولانجلە؛ بچویک؛ بیچک؛ وردی؛ وردیکلانە؛ گولانجلێ؛ گولالە (نێرینە)؛ گولالێ (مێینە) ‹کودک خرد: منالی ورد› ٢. گەمڕ؛ لەت‌وپەت؛ چرت؛ فرد؛ داشکاو یان دابەشکراو بە پاژگەلی چکۆلە ‹استکان را انداخت و خرد کرد: پیالەکەی داخست و وردی‌کرد› ٣. *[ادبی]* کەم؛ کێم؛ گەمڕ؛ ڕێز؛ ریز ‹ز آب خرد ماهی خرد خیزد: لە ئاوی کەمدا ماسیی ورد هەڵدێ› ٤. *[مجازی]* هووردار؛ بێ‌نرخ؛ بێ‌بایەخ؛ چرووک ‹نزد دوستانش خرد شد: لە لای هەواڵەکانیەوە ورد بوو› ❋ **خورد**

▣ **خرد کردن:** وردکردن؛ پەرچقاندن؛ گەمڕاندن؛ قەرمچاندن؛ توتووخاندن؛ چرت کردن؛ گژمراندن؛ خنگارکرن: ١. شتێ بە شێوەی بەشگەلێکی چکۆلە دەرهێنان ٢. شکاندن؛ مارەی؛ مارتەی ٣. *[گفتاری]* تێک‌شکاندن؛ تێک‌وپێک‌دان. هەروەها: **خرد**

شدن

**خرداد** / xordād/: *اسم.* جۆزەردان؛ جۆدرەو؛ جۆزەرد؛ کۆکەن؛ گیاچنین؛ سێهەمین مانگی بەهار لە ساڵی هەتاویدا کە ۳۱ ڕۆژە.

**خردبین** / xordbîn/: *صفت. [کنایی، گفتاری]* کورتبین؛ هوردبین؛ خاوەن خووخدەی کورتبینی: **خوردبین**

**خردبینی** / xordbînî ، ـها/: *اسم. [کنایی، گفتاری]* کورتبینی؛ هوردابینی: **خوردبینی**

**خرد ـ خرد** / xordxord/: *قید.* وردە ـ وردە؛ وارە- وارە؛ چکە-چکە؛ ڕیزە- ڕیزە؛ کوچە-کوچە؛ هوورک-هوورک؛ کوچلە-کوچلە؛ کەم-کەم؛ بەرە-بەرە؛ سەورە-سەورە؛ لە بەریکەو؛ بە سۆنگە و لە سەر خۆ ‹خرد-خرد مال‌اندوزی کرد: وردە-وردە ماڵی کۆ کردەوە›.

**خردزیستمند** / xordzîstmand ، ـان/: *اسم. [زیست‌شناسی]* وردژیلەوەر؛ وردیلەژی؛ گیانەوەری زۆر وردیلە کە تەنیا بە میکرۆسکۆپ دەبیندرێت: **خردسازواره**

**خردسازواره** / xordsāzvāre/ ☜ **خردزیستمند**

**خردسال** / xordsāl/: *صفت.* کەمساڵ؛ کەم تەمەن؛ مناڵ‌کار؛ مێرمناڵ؛ مێرمنداڵ؛ خاوەن تەمەنی کەم (پتر لە نێوان ۲ تا ۷ ساڵ). هەروەها: **خردسالی**

**خردکننده** / xordkonande/: *صفت. [مجازی]* تێکشکێن؛ گەڕگەسێنەر؛ هۆردکەر؛ بە بار و دۆخ یان چۆنیەتیەک کە دەبێتە هۆی ورد بوون، زیان لێکەوتن یان شکستی زۆر ‹حادثەی خردکننده: کارەساتی تێک‌شکێن›.

**خردگرایی** / xeradgerāyî/: *اسم.* ئاوەزگری؛ ئاوەزخوازی؛ مژی‌خوازی؛ مژی‌گراوی؛ ئامۆژەیەکی فەلسەفی کە ئاوەز بە سەرترین پێوەری ناسینی ڕاستەقینە دەزانێ: **اصالت عقل؛ اصالت تعلق**. هەروەها: **خردگرا**

**خردگریزی** / xeradgorîzî/: *اسم.* ۱. دژەئاوەزی؛ دژبەمژی؛ دژایەتی لەگەڵ بیرکردنەوە و وردبوونەوە و ڕاوێژکاریدا ۲. دوزەنەیێکی فیکری بڕوامەند بە تێگەیشتن لە ڕێی دڵ و هەست یان ئیمانەوە، بە جێی بیرکردنەوە یان بەڵگە هێنانەوە.

**خردل** / xardal ، ـها/: *[عربی] اسم.* خەردالە؛ خەرتەلە؛ خەردەڵ؛ خەرتەل؛ غەردەل؛ خەرداڵە؛ شێلمۆک؛ گیایەکی ئالیکی یەک‌ساڵان لە تیرەی ئیسیوەت و ئالات.

◙ **خردل** سفید: خەرتەلە سپیلکە؛ تاس‌ئەور؛ تینەگیا؛ ترەوکە؛ شێلمۆ سپی؛ جۆرێک گیاخەرتەلەی گوڵ‌زەردی بۆنخۆشی دانەدرشتی زەردی ئاماڵ‌سوورە، تامێکی توندی هەیە و تام خۆشکەری برێ چێشتە.

**خردل** سیاه: خەرتەلە ڕەشە؛ شیلمۆکە ڕەشە؛ شێلمۆ ڕەشە؛ شێلمۆ ڕەشکە.

**خردل وحشی**: شەلەمەباخی؛ تۆپەڵەگیا؛ گەرمەژن؛ توونەگیا؛ شاتەڕەی دەیمی؛ جۆرێ خەرتەلەیە کێوی دەڕوێ.

**خردلی**[1] / xardalî/: *[عربی] اسم.* خەردەلی؛ ڕەنگی قاوەیی ئاماڵ زەرد.

**خردمند** / xeradmand ، ـان/: *صفت. [ادبی]* مژیوەر؛ ژیر؛ ژیرلە؛ ژیرلێ؛ ژیرۆل؛ ژیروان؛ ژیرڤان؛ ئاوەزمەند؛ بیرەوەر؛ بیرمەند؛ ژیرەک؛ خاوەن برستی تێفکرینی ئاوەزمەندانە.

**خردمندانه**[1] / xeradmandāne/: *صفت.* ژیرانە؛ مژیوەرانە؛ ئاوەزمەندانە ‹سخن خردمندانە: وتەی ژیرانە›.

**خردمندانه**[2]: *قید.* ژیرانە؛ مژیوەرانە؛ ئاوەزمەندانە؛ بە ڕێوشوێنی ژیران ‹خردمندانە رفتار می‌کرد: ژیرانە دەجووڵاوە›.

**خردمندی** / xeradmandî/: *اسم.* ژیری؛ مژیوەری؛ ژیروانی؛ ژیرڤانی؛ ئاوەزمەندی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ژیر بوون.

**خرد و خاکشیر** / xord-o-xākšîr/: *صفت.* ورد و خان؛ ورد و هان؛ ورد و هاڕ؛ ورد و خاڵ؛ ورد و خاش؛ ورد و خاڕ؛ لەت و پەت؛ هێت و پێت؛ هەپروون-هەپروون؛ شکاو بە شێوەی پاژگەلی زۆر ورد ‹شیشە خرد و خاکشیر شد: شووشەکە ورد و خان بوو›.

**خرد و خمیر** / xord-o-xamîr/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[گفتاری]* شەل و پەت؛ شڕ و وڕ؛ شڕ و کوت؛ لەت و پەت؛ شی و شیتاڵ؛ تۆپانتڕ؛ ورد و هاڕیاگ؛ مانیاو مەردە ‹زیر مشت و لگد تمام بدنش را خرد و خمیر کردند: لە ژێر مست و پاڵەقەدا ئازای گیانیان شەل و پەت کرد›.

▣ **خرد و خمیر کردن:** هەرستاندن؛ هەرستین؛ شەلوپەتکردن.

**خردورزی** / xeradvarzî/: *اسم.* مژیوەری؛ ئاوەزمەندی؛ ژیری؛ کار یان ڕەوتی کەڵک وەرگرتن لە هزر و بیر.

**خرد و ریز** / xord-o-rîz، ـها/: *اسم.* وردەواڵە؛ شتگەلی چکۆلە و جۆراوجۆر (زیاتر کەم بایی): **خُردەریز**

**خرده**[1] / xorde/: *اسم.* ۱. چکێ؛ چکێک؛ کەمێک؛ تۆزێک؛ ڕیزەیەک؛ کەمێ؛ تۆزێ؛ نەختێ؛ هێندێ؛ کوچێو؛ کوچالێو؛ کوچلانجلێو؛ بەشێک کەم لە شتێک ‹یک خرده آب بە من بدە: چکێ ئاوم بدەرێ› ۲. ڕیزەیەک؛ چکێ؛ کەمێ؛ هێندێ؛ بەشێکی چکۆلە لە شتێک ‹یک خرده کار ماندە بود: ڕیزەیەک کار مابوو› ۳. وردە؛ ورکە؛ وردکە؛ ورتکە؛ هیردە؛ هوورکە؛ ڕیزە؛ تیکەی شکاو، دڕاو یان بڕاو لە شتێک ‹خردەی نان: وردەی نان› ٤. پەڵپ؛ وردە ‹خرده گرفتن: پەڵپ گرتن› ❋ **خورده** *[گفتاری]*

▣ **خرده گرفتن:** پەڵپ پێگرتن؛ وردەگرتن؛ بڕ و بیانوو هێنانەوە؛ عەیب لێگرتن ‹ما کە بە او خرده می‌گیریم باید کار خودمان بهتر باشد: ئێمە کە پەڵپی پی دەگرین ئەبێ کاری خۆمان چاتر بێ›.

**خرده**ـ[2]: *پیشواژە.* وردەـ؛ هوردەـ؛ هیرەـ: ۱. چکۆلە ‹خردەمالک: وردەمالک› ۲. چکەـ؛ کەچەـ؛ ڕێزەـ؛ کەم ‹خردەحساب: وردەحەسێو› ۳. ڕێزەـ؛ ورکەـ؛ هوورکەـ؛ لەت، دڕاو یان شکاوی شتێک ‹خردەنان: وردەنان› ❋ **خورده** *[گفتاری]*

**خردەبردە** / xordeborde/ ☜ **خُوردە بُردە**

**خردەبورژوا** / xordebûrj(u)vā، ـها/: [فارسی/ فرانسوی] *اسم.* وردەبورژوا؛ وردەپا: ۱. وردەمەلکدار؛ وردەمالیک؛ پیشەوەرێ کە خاوەنی ئامێری بەرهەم هێنان یان سەرمایەی خۆیەتی، بەلام بۆ بژیوی ژیانی ناچار بە کار کردنە ۲. *[مجازی]* هەر یەکە لە ئەندامانی چینی مامناوەندی شار.

**خردەبورژوازی** / xordebûrj(u)vāzî/: [فارسی/ فرانسوی] *اسم.* وردەبورژوازی؛ وردەپایی: ۱. وردەمالیکی؛ چینی ژێرووی بورژوازی کە هەرچەندە خاوەن ئامێری بەرهەم هێنان یان سەرمایەی خۆیانن، بەلام ناچارن بۆ بەڕێچوونی ژیانیان کار بکەن و پتر لە لایەن سەرمایەدارانەوە دەچەوسێنەوە: **بورژوازی کوچک** ۲. *[مجازی]* چینی مامناوەندی شار.

**خردەبین** / xordebîn/: *صفت.* کورتبین؛ هوردبین؛ خاوەنی خوو و خدەی کورتبینی.

**خردەبینی** / xordebînî/: *صفت.* کورتبینی؛ هوردبینی؛ چۆنیەتی لێکۆڵینەوە و دۆزینەوەی عەیب و بابەتی بچووک و نە زۆر گرنگ.

**خردەپا** / xordepā، ـها/: *صفت.* کەمداهات؛ کێمبارەچە: ۱. کاسبی کەم مایە ۲. جووتیاری خاوەن کەمێک زەوی و زار.

**خردەحساب** / xordehesāb، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* وردەحەسێب؛ وردەحەساو: ۱. قەرزاری یا بسێنکاری کەم ‹یک خردەحساب ماندە بود کە آن را هم پرداختم: هێندێک وردەحەساو مابوو، ئەویشم داوە› ۲. *[کنایی]* دژمنایەتی؛ ڕک و دژمنی.

◙ **خردەحساب با کسی پاک کردن**:*[کنایی]* لە کەسێ پاک بوونەوە؛ تۆڵەکردنەوە؛ تۆڵە سەندنەوە لە کەسێ ‹به بهانه‌ی رسیدگی به کارها می‌خواستند خرده‌حسابهایشان را با هم پاک کنند: بە بیانووی پێڕاگەیشتن بە کارەکان دەیانەویست لە حیسابی یەک پاک بنەوە›.

**خردەخرجی** / xordexarcî، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* وردەخەرجی؛ خەرجگەلی کەم و جۆراوجۆر ‹یک خرده‌خرجی‌هایی مثل کرایه ماشین توی هم خرج روزانه است: برێ وردەخەرجی وەک کرێ ماشین، هەر لە ناو خەرجی ڕۆژانەدایە›.

**خردەریز** / xorderîz/ ☜ **خُرد و ریز**

**خردەفرمایش** / xordefarmāyeš، ـها/: *اسم.* *[مجازی]* وردەفەرمایش؛ وردەفەرمایشت؛ دەستوور یان فەرمانی ناڕەوا و بێ‌جێ ‹این آقای رئیس هم چقدر خرده‌فرمایش دارند: ئەم سەرۆکیشە چەندە وردەفەرمایشی هەیە›.

**خردەفروشی** / xordefurûšî، ـها/: *اسم.* وردەفرۆشی؛ تاکفرۆشی: ١. کار و ڕەوتی فرۆشتنی شتومەک بە ئەندازەی پێویستی خەڵک ٢. فرۆشگایێ کە کاڵا بە ئەندازەی پێویستی خەڵک دەفرۆشرێ. بەرانبەر: **عمدەفروشی**. هەروەها: **خردەفروش**

**خردەکاری** / xordekārî، ـها/: *اسم.* وردەکاری: ١. کارگەلی بچووک، کەم بایەخ و جۆراوجۆر ‹از این خرده‌کاری‌ها خلاصی ندارم: لەم وردەکاریانە ناخەلسم› ٢. بەشێکی کەم لە کار کە بۆ تەواوکردنی بەرنامەیێک یان چێکردنی شتێک دەبێ بکرێ ‹این خرده‌کاری آسایش مرا گرفته است: ئەم وردەکاریە ئاسایشی بریوم›.

**خردەگیر** / xordegîr، ـان/: *صفت.* وردەگر؛ ڕەخنەگر؛ پەڵپگر؛ خاوەن خوو و خدەی ڕخنەگری.

**خردەگیری** / xordegîrî، ـها/: *اسم.* وردەگری؛ ڕەخنەگری؛ کار یان ڕەوتی ڕەخنە و پەڵپ گرتن، بەتایبەت لە شتی بچووک و بێ‌بایەخ.

**خردەمالک** / xordemālek، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *اسم.* جۆچین؛ وردەمالیک؛ کەسێ کە خاوەنی زەوینێکی بچووکی کشتوکاڵە.

**خررنگ‌کن** / xar.rangkon/: *صفت.* *[تعریض]* ساختەچی؛ گزیکار؛ فێڵباز؛ زەخەڵ؛ کەلەکباز؛ مەکرباز؛ فریوکار؛ مەکرین؛ زۆڵ؛ دەهۆباز.

**خرزور** / xarzûr/: *صفت.* *[تعریض]* کەرزۆر؛ بەهێز؛ زۆردار ‹خیلی خرزور است، میز را تنهایی بلند می‌کند: یەکجار کەرزورە، مێزەکە بە تەنیا بەرز دەکاتەوە›.

**خرزە** / xarze/: *اسم.* *[مستهجن]* ملەورچ؛ خرزە؛ سیرەتی‌زل؛ گونی‌زل؛ ئەندامی نێرینەی پیاو کە لە ڕادەی ئاسایی گەورەتر بێ.

**خرزهرە** / xarzahre/: *اسم.* کەرکوژە؛ ژاڵە؛ ڕوول؛ ڕوولک؛ ژاڵک؛ ژەلە؛ ژەلە؛ ڕیل؛ ڕویل؛ لوولک؛ لۆرک؛ لوێر؛ لوور؛ لوورک؛ قرژانک؛ دارۆکەیەکی جوانی ژەهراوی، گەڵا ئەستوور، پڕ لەق و پۆی چەتر ئاسا.

**خرس** / xers/: *اسم.* ورچ؛ هرچ؛ خرس؛ هورچ؛ هەشە؛ هەرس؛ هرس؛ حورچ؛ حش؛ حەش: ١. *ـها/* گیانەوەرێکی گوهانداره کە زیاتر لە نیوەی باکووری زەوی دەژی و هەموو شتێک دەخوا، بە تەختایی پێ دەچێتە ڕێوە و چنگاڵەکانی هەمیشە بە دەرەوەن. کولک و مووی زۆر و پڕی هەیە، کلکی کورت و جەستەی گەپ و قورسە ٢. *[نجوم]* حەوتەوانە؛ ناوی دوو وێنەی ئاسمانی لە نیوەی باکووری زەوی ‹خرس بزرگ و کوچک: ورچی گەورە و بچووک›.

◙ **خرس بزرگ**:*[نجوم]* ورچی گەورە؛ حەوتەوانەی گەورە؛ وێنەیەکی ئاسمانی گەورەیە بریتی لە حەوت ئەستێرەی درەوشەدار کە لە بەناوبانگترین ئەستێرەکانی ئاسمانن: **بنات‌النعشِ کبرا؛ دُبّ اکبر؛ هفت**

اورنگ مهین

**خرس خاکستری:** ورچی خۆڵەمێشی؛ ورچێکی زەوین ژییە کە زۆرتر لە بژوێندا دەژی.

**خرس سیاه:** ورچی ڕەش؛ جۆرێ ورچی ڕەش، دارچینی یان قاوەییە کە لە نیوەی زستاندا دەچێتە خەوی زستانیەوە.

**خرس قطبی:** ورچی پۆلی؛ هورچی قوتبی؛ ورچی گەوری دەڤەری جەمسەری باکووری بە سەر و ملی گچکە، ددانی تیژ و لەشی سپی تووکنەوە.

**خرس کوچک:** *[نجوم]* حەوتەوانەی بچووک: **بنات‌النعشِ صغرا؛ دُبّ اصغر؛ هفت اورنگ کهین**

**خرس گنده:** *[تعریض]* ورچەکۆن؛ ورچەقوڵە؛ ورچەکولە؛ کۆڵەورچ؛ کوتەخرس؛ خرسەکۆن؛ قەپە؛ زلە؛ گۆپۆ؛ تەژە؛ حەپەنتی؛ حەشەپەڕۆینە؛ گەلحۆ؛ گتە؛ خیگە؛ گەوەزە؛ قەڵەوی تەوەزل.

**خرس مورچه‌خوار** ☜ **آرد‌وارک**

▣ **با خرس به/ توی جوال رفتن:** *[کنایی]* لەگەڵ ماردا نووستن؛ لە بەخەڵ مارا خەفتن؛ لەگەڵ سەگدا چوونە چاڵەوە؛ لەگەڵ کەسێکی نالەباردا تێهەڵچوون و تێکەڵ بوون.

**خرسند** / xorsand/: *صفت.* *[ادبی]* ڕەزامەند: ١. دڵخۆش؛ شادومان؛ خۆشحاڵ؛ دڵڕەزا؛ شاد؛ دلشاد؛ دلگەش لە ڕووداو یان ئاکامی کارێک ٢. قانع؛ ڕازی؛ خوازیاری ئەو دۆخە تێیدایە * **خورسند**

**خرسک** / xersak/: *اسم.* ١. کۆڵەورچ؛ بەچکەورچ ٢. خرسەک؛ جۆرێک قاڵی درشتی تووک درێژ.

**خرسندی** / xorsandî/: *اسم.* ڕەزامەندی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕەزامەند بوون: **خورسندی**

**خرسنگ** / xarsang/: *اسم.* گابەرد؛ گاشە؛ کەڕا؛ هیم؛ زۆپ؛ تاوێر؛ گاشەبەرد؛ هێزک؛ تەلەسەنگ؛ بەردی زل.

**خرطوم** / xortûm/: [عربی] *اسم.* لمۆز؛ لمبۆز: ١. قۆرتم؛ قرتم؛ قورتم؛ خورتووم؛ ئەندامێکی درێژی هەڵگرەوە، گۆشتین و نەرم، بریتی لە بێڤل و لەوسی سەرووی گوهاندارانی قرتمدار (وەک فیل) ٢. دەرزیە؛ ئەندامێکی باریکەڵە و لوولەئاسای هەڵلووشێن لە مێرو و کرمدا.

**خرطومی** / xortûmî/: [عربی] *صفت.* خورتوومی؛ قورتمی؛ بە شکڵ و شێوەی قورتم ‹لولەی خرطومی: لوولەی خورتوومی›.

**خرغلت** / xarqalt/: *صفت.* *[تعریض]* کار و ڕەوتی تلدان؛ تلدانەوە؛ تلان؛ خلان؛ خلۆپان؛ گلان؛ لە سەر زەویندا خۆ تلاندنەوە ‹اینقدر روی این خاکها خرغلت نزن: ئەوەندە لە سەر ئەم خاک و خۆڵە تل مەدە›. هەروەها: **خرغلت زدن**

**خرف** / xeref/ ☜ **خرفت**

**خرفت** / xereft، ـها/: [از عربی] *صفت.* هورفی؛ خەرەف؛ خەرفاو؛ خەرفی؛ خەرفیو؛ زورهان؛ هۆش لێ بڕاو لە بەر کزی یان پیری: **خرف** *[گفتاری]*. هەروەها: **خرفتی**

**خرفه** / xorfe، ـها/: *اسم.* پەلپینە؛ پەلپین؛ پەرپین؛ پەرپینە؛ پەرەپەلیک؛ پارپارە؛ پرپرە؛ پرپریک؛ پرپلیک؛ پیرپیلیک؛ پەرەپیلیک؛ ددان تیژکەرە؛ ڕوەکێکی گەڵا و لاسک گۆشتنە کە لە نێو بێستانان زۆرتر بە شێوەی گیابژار دەڕوێ و جۆرێ چێشتی خۆرشتی لێ دروست دەکرێ.

**خرفهم** / xarfahm/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[تعریض]* بە گوێدا چوو؛ حاڵی‌بووگ.

▣ **خرفهم شدن:** بە گوێدا چوون؛ فامین؛ حاڵی بوون ‹پس از یک ساعت توضیح دادن آخرش خرفهم شد: دوای سەعاتێک شی‌کردنەوە ئاخری بە گوێیدا چوو›.

**خر فهم کردن:** بە گوێدا کردن؛ بردنە کەڕەکەوە؛ تێگەیاندن؛ فاماندن؛ حاڵی کردن ‹کمی خنگ است، باید خوب خرفهمش کنی: کەمێ خولە، دەبێ باش بە گوێیدا بکەی›.

**خرق** / xarq, xerq /: [عربی]/اسم. [ادبی]/ ۱. چاک؛ تلیش؛ قەڵش؛ شەق؛ دڕاوی؛ قەڵشاوی؛ کەلەشتاوی؛ تلیشاوی؛ پەڕتاوی ۲. کار یان ڕەوتی دڕاندن یان قەڵشاندن؛ پەڕتاندن؛ کەلاشتن.

▣ **خرق عادت**: نائاسایی؛ بەدەر لە عادەت.

**خرقە** / xerqe ، ـها/: [عربی]/اسم. کەڵپۆس؛ خەرقە؛ باڵاپۆشی دەرویش.

▣ **خرقه تهی کردن**: /[مجازی]/ کۆچی دوایی کردن؛ دنیا بە جێ هێشتن؛ بارگە و بنە دانان؛ بالگە پێچان؛ دڵ لە خورپە کەوتن؛ چاو لە دنیا بەستن؛ جلی دنیا داکەندن؛ هەوار جەم کردن ‹سرانجام در سال ۱۳۲۰ خرقه تهی کرد: لە ئاکامدا ساڵی ۱۳۲۰ کۆچی دوایی کرد›.

**خرقەپوش** / xerqepûş ، ـها؛ ـان/: [عربی/فارسی] صفت. ۱. شڕەبار؛ کۆنەپۆش؛ شڕپۆش؛ سیپاڵپۆش ۲. دەرویش؛ بێمبالات بە ماڵوسامان.

**خرک** / xarak ، ـها/: اسم. ۱. تیر یان سێپایەیەک کە دارتاشان بۆ تاشین و بڕینەوەی چێو و تەختە بە سەریەوە، کەڵکی لێوەردەگرن ۲. داربەس؛ داربەست؛ تەختە یان دارێ کە بەنایان بۆ کارکردن لە بەرزی لە سەری ڕادەوەستن ۳. [ورزش] خەرەک؛ چوارپاچکەی تەسک و درێژ لە وەرزشتی ژیمناستیکدا ٤. [موسیقی] خەرەک؛ پارچە چێو یان ئێسقانی لە سەر کاسەی بڕێک سازی ژێدار، بۆ بەرگری لە لێک کەوتنی سیم و کاسە ٥. هەرەتێلە؛ هوریلێ؛ کەرەچکۆلە؛ کورینک؛ کورین؛ جانی؛ سێنرین؛ شیرە؛ کەری باڵا بچووک ‹خرکی را به عروسی خواندند: هەرەتێلەیەکیان دەنگ کرد بۆ شایی›.

**خرکاری** / xarkārî ، ـها/: اسم. [تعریض] کەرژالی؛ تووڕەکاری؛ کاری زۆر و گران و کەمبایەخ. هەروەها: **خرکار**

**خرکچی** / xarakčî ، ـها/: اسم. کەرچی؛ وڵاخدار؛ وڵاخار؛ ئوڵاخدار؛ ئوڵاغار: ۱. کەردار؛ خەربەندە؛ کەسێ کە کەر بە کرێ دەدا ۲. کەسێ کە بە کەر بار دەکێشێ.

**خرکی**[1] / xarakî /: صفت. [گفتاری] کەرانە؛ هەرانە؛ کەرەکی؛ گەوجانە و نالەبار ‹شوخی خرکی: گاڵتەی کەرانە›.

**خرکی**[2]: قید. [گفتاری] کەرانە؛ هەرانە؛ کەرەکی؛ وەک کەر؛ بە شێوەی گەوجانە و نالەبارانە ‹خرکی بازی می‌کرد: کەرانە کایەی دەکرد›.

**خرگاه** / xargāh ، ـها/: اسم. [ادبی] ۱. هۆبە؛ شاهۆ؛ خەرگا؛ تارم؛ تاوڵ؛ سەراپەردە؛ چادری گەورە یان کۆمەڵەی ڕەشماڵان بۆ هەواری کەسانی خاوەن پلە و پایە ۲. [کنایی] ئاسمان.

**خرگوش** / xargûš /: اسم. کەروێشک؛ کەوریێشک؛ کەوریشک؛ کەرووشک؛ کوێریشک؛ کێفرۆشک؛ کیڤریشک؛ کێرووشک؛ کەڤرۆشک؛ کێڤرویشک؛ کەرویە؛ هەوریشە؛ خەروێ؛ کەرگۆە؛ کەروێ؛ قولەشین؛ هەروی؛ کێرگو: ۱. /ـها؛ ـان/ گیانەوەرێکی گوهانداری گیاخۆر، شت جاو، گوێدرێژ، جووچکە کورت و خۆشبەزە ۲. [نجوم] وێنەیەک لە ئاسمانی نیوەگۆی باشووری، لە نزیکی ڕاوچیەوە: **آرنب** ۳. چوارەمین ساڵی ساڵپێوی تورکستانی ☜ **تقویم**

**خرگوشک** / xargûšak /: اسم. گایەمە؛ گاومە؛ گاوەمە؛ گاولمە؛ گادوومە؛ پەلۆش؛ گولەتۆزینە؛ بالووکبڕە؛ گوێبەرخە؛ گوێبەرخۆڵ؛ تۆمگیر؛ بنە گیایێکی گەلا تیسکن، گوڵ گەورە و زەردی هێشوویەوە، گەلا و گولەکەی بۆ کارکردنی زگ باشە: **گل ماهور؛ ماهوتی**

**خرم** / xorram /: صفت. [ادبی] گەوش؛ گەوز؛ گەش: ۱. پەژ؛ تەڕچک؛ پاراو؛ سەرسەوز؛ تەوزاو؛ تێراو؛ خاوەنی تەڕی و پاراوی ‹دشت سبز و خرم: دەشتی پەژ› ۲. شادمان؛ سەرشاد ‹شاد و خرم:

شاد و گەش›.

**خرما** / xormā/:اسم. خورما؛ خورمە؛ خوورما؛ خورماوی؛ هورما؛ قەسپ: ١. خورماوە؛ دارێکی بەرزی گەرمیانە، بە قۆتەی خڕ و لق و پۆپی وەک چەتر لە سەرەوە. بەرەکەی هۆشەییە و لە هەوداکەی تەناف دەهۆننەوە ٢. میوەی ئەو دارە کە شیرین و گۆشتن و ناوکدارە.

**خرمائی** / xormā'î/ ☜ **خرمایی**

**خرماپزان** / xormāpazān/:اسم. تۆفی گەرما؛ وەرزی پێگەیشتنی خورما.

**خرمالو** / xormālû/:اسم. خورمالوو؛ خورمال: ١. دارێکی چەندجۆرەی خەزەڵوەری دەوەری ڕۆژهەلاتی دوورە ٢. /ـها/ میوەی جۆرێ لەو دارە کە لە تەماتە دەکا و بە ڕەنگی نارنجی گۆشتن، ئاودار و شیرینە.

**خرمایی**[1] / xormāyî/:اسم. خورمایی؛ ڕەنگی زەردی تۆخ مەیلەو قاوەیی کاڵ: **خرمائی**. هەروەها: **خرمایی‌رنگ**

**خرمایی**[2] صفت. خورمایی؛ بە ڕەنگی زەردی تۆخ مەیلەو قاوەیی کاڵ: **خرمائی**.

**خرمگس** / xarmagas، ـها؛ ـان/:اسم. مێشەکەرانە؛ مێشەکەران؛ مەلشە؛ مۆزک؛ چیز؛ مۆزەشینە؛ کەرەنگێزە؛ خەرەنگەز؛ خەرەنگەزە؛ خەرەنگێز؛ خەرمەگەز؛ کەرمێش؛ کەرمۆز؛ گولال؛ گازولک؛ مێشێکی کەسکی گەورەتر لە ڕادەی ئاساییە بە ئاژەڵەوە ئەدا و ڕاگوێزی نەخۆشی ئاژەڵە بۆ مرۆ.

▣ **خرمگس معرکه شدن**: ١. [مجازی] بوونە کوتەکی ناو چڵپاو؛ بوونە دووکەڵ بۆ چاو؛ بوونە هۆی ئازاری دیتران ٢. بوونە کتکە نەفتینە؛ بوونە ئاورخۆشکەرە؛ ئاژاوە نانەوە لە کۆڕێکدا؛ هەرا و قەپ و قاڵ خستنە ڕێ.

**خرمن** / xarman، ـها/:اسم. خەرمان: ١. جۆخین؛ خرمان؛ خەرمن؛ جێخوون؛ بێندەر؛ بێدەر؛ ترت؛ خەلەی درواو کە لە شوێنێکدا کۆما بووە ٢. خەرمانە؛ تەپلە؛ کۆگا؛ کۆمە؛ هەر شتێکی وەک خەرمان خڕ بووبێتەوە ‹خرمن گل: خەرمانی گوڵ›.

▣ **خرمن باد دادن**: شەن‌کردن؛ شەن کەردەی؛ لێک جوێ‌کردنەوەی دان و کا بە با.

**خرمن برداشتن**: خەرمان هەڵگرتن؛ بردنی خەلە یان داهاتی کۆمابوو لە خەرمانگاوە.

**خرمن کردن**: خەرمان کردن؛ کۆگا کردن؛ گرد و کۆ کردنی شتێ بەتایبەت بەرهەمێک لە شوێنێکدا.

**خرمن کوفتن**: خەرمان کوتان؛ خەلەکوتان؛ خەرمن هەڕین؛ لێکردنەوەی دەخڵ و دان لە پووش و کلۆش بە خەرمانکوت.

**خرمن‌پا** / xarmanpā، ـها/:اسم. خەرمانەوان؛ پاسەوانی خەرمان.

**خرمنجا** / xarmancā/ ☜ **خَرمَنگاه**

**خرمندی** / xormandî، ـها/:اسم. ١. چەشنێ خورمالووی جەنگەڵی ٢. کەلهوو؛ دارێکی جەنگەڵی گەڵادرێژووکەی گوڵوردی میوە فنق‌ئاسای قاوەیی ڕەنگە.

**خرمن‌سوخته** / xarmansûxte، ـها؛ ـگان/:اسم. ١. خەرمان ئاوبردوو؛ خەرمان سووتاو؛ کەسێ کە ئاور بەربۆتە خەرمانی ٢. [کنایی] ماڵ ویران؛ ڕەنجبەبا؛ ڕەنجەڕۆ؛ مرۆی نامراد و زیان دیتوو.

**خرمنکوب** / xarmankûb/:اسم. چوو؛ جەنجەڕ؛ جەنجەر؛ جەنجەرە؛ جەڕجەڕ؛ مۆشەن؛ گام؛ خەرمانهەڕ؛ ئامراز یان ماشینی کوتان و جیاکردنەوەی کا و کلۆش لە دان.

**خرمنکوبی** / xarmankûbî/:اسم. گێرە؛ خەڕە؛ هۆلی؛ هۆل؛ هۆلە؛ هۆڵە؛ کار و ڕەوتی ورد کردنی دەغڵ و گیا و جیا کردنەوەی دان لە کا و کلۆش.

**خرمنگاه** / xarmangāh، ـها/:اسم. خەرمان؛ خەرمانگا؛ بێدەر؛ جێ خەرمان؛ شوێنێ کە وەرزێران خەلە و خەرمانی خۆیانی تێدا کۆ

دەکەنەوە: **خرمن‌جا**

**خرمهره** / xarmohre ، ـها/:اسم. گـڕک؛ گـڕی؛ کوژەکـە؛ کـۆرژا؛ کووژەکـە؛ مـوورا؛ مووره‌کـە؛ مۆرەکـــە؛ خـــەرموورگ؛ مـــووروەکەرانـــە؛ کووژەکەرانە؛ موورگـەکەوڵـە؛ موورگـەکەوەڵـە؛ مـووروی درشـت و شـین، پتـر بـە کورتـانی کەرەوەی دەدروون.

**خرمـی** / xorramî/:اسم. تـەرچکی؛ پـەژی؛ گەوزی؛ گەشی؛ سەرسەوزی؛ دۆخ یان چۆنیەتی پەژ و گەش بوون.

**خرناس** / xornās ، ـها/:اسم. پرخـه: ١. پرخـە؛ پرخ‌پاخ؛ خرین؛ خـرـخـر؛ خـرپف؛ مـرخ؛ ڤـزە؛ خرپوق؛ خرپە؛ دەنگی هەناسەدانی بـرێ کـەس بەتایبەت بە سـالاچووان لـە خـەودا. هـەروەها: **خرناس کشیدن** ٢. مرە؛ گـوڕە؛ مرخـە؛ هووشـە؛ لووشە؛ نەڕە؛ مەڕژ؛ دەنگی زڕوی برێ گیانـداری گۆشتخۆر بەتایبەت لە کاتی تووڕەییدا: **خرناسه**

**خرناسه** / xornāse/ ☜ **خرناس-٢**

◘ **خرناسه کـشیدن**: ڤـزین؛ مرانـدن؛ گوڕانـدن؛ مرخاندن؛ نەڕاندن.

**خرند** / xarand ، ـها/:اسم. خەرەند؛ کەمە؛ لێوار؛ بـەس؛ گـورمکی؛ زۆپـی؛ باخچـە و جۆگەلـە و لێوارەی شەقام.

**خرنـوب** / xarnûb ، ـهـا/:اسم. خـــڕنووک؛ خـەرنووک؛ ئەسـتری؛ سـەرپنج؛ حەچەمچـە؛ مەحچە؛ حـس و خوشمـە؛ پاکـەمتیار؛ شاڤـێر؛ دارێکی درکاوی گەڵا پنچ و گوڵ هێشووە.

**خـروار** / xarvār ، ـها/:اسم. خـەروار؛ خەڵـوار؛ خەربار: ١. یەکەی کێشانە لە کۆندا بەرانبەر بـە سێـسەد کیلـۆ ٢.*[مجـازی]* هەنـدێکی زۆر لـە شتێک.

**خر و پف** / xor-o-pof/: *صوت*. پرخە؛ پرخـەپرخ؛ خرپـوق؛ دەنگـی هەناسـەدانی بـرێ کـەس لـە خەودا.

**خروج** / xurûc, xorûc/: [عربی]/اسم. ١. کار یان ڕەوتی دەرکەوتن؛ وەدەرکـەوتن؛ هاتنـە دەرەوە لە جێگەیەک ٢.*[قـدیمی]* شۆڕش؛ ڕاپەڕین؛ سەر هەڵدان.

◘ **خـروج کـردن**:*[مجـازی]* ڕاپــەڕین؛ ڕاسـت بوونەوە؛ هەستانەوە؛ شۆڕش‌کردن.

**خروجـی** / xurûcî, xorûcî ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ١. چوونەدەر؛ دەرەوەیی؛ جێ دەرکەوتن؛ جـێ چوونـە دەرەوە‹در خروجـی: دەرکـەی چوونـەدەر› ٢. گـونج؛ کـون یـان دەرکەیـەک بـۆ هاتنـە دەرەوەی ناواخنی شتێک ‹خروجی استخر: گونجی ئەستێر› ٣. ئاگاداری کۆوەبوو لە کۆمپیۆتەر یـان ماشین‌حەساودا ٤. ڤەدە؛ وەدە؛ لێهات؛ بەرهـەم ٥.*[گفتاری]* بەرایی چوونە دەرەوە لە شوێنێک.

**خروس** / xurûs, xorûs ، ـهـا/:اسم. کەڵـەباب؛ کەڵــەباب؛ کـــەرەباب؛ کەڵەشـــێر؛ کـــەڵەشێر؛ کەرەشێنە؛ کەرشێر؛ کەرەشێل؛ دیکـل؛ دیقـل؛ کووک؛ کەڵەکووک؛ لفی مریشک.

◙ **خروس بی‌محل**:*[مجازی]* کەڵەشێر ناوەخـت؛ گووز نـاخلاف؛ تـڕ ناخـافڵ؛ ئـەوەی نابـەجێ داخێوێت ‹حالا تو چرا خروس بی‌محل شدی؟ مگـر قرار نبود حرف نزنی؟: ئێستا بۆچی بوویە کەڵەشێر ناوەخت؟ مەگەر بڕیار نەبوو قسە نەکەی؟›.

**خروس جنگی**: ١.کەڵەبابی شەڕانی؛ کەڵەشێر لاری؛ کەڵەبابی بارهاتوو بۆ کەڵەشێرەجەنگێ ٢.*[مجـازی]* سەگی هـەواران؛ وەیخـڕ؛ ناخـار؛ شەڕانی؛ شەڕاشۆ؛ جەنگەڕانی؛ مرۆی گـورخ و شەڕخواز.

**خروس‌کولی**: زیقاوە؛ جیقۆلـە؛ داڵداڵەکۆسـە؛ داوداوەکۆسـتە؛ قـیقـیداوکـە؛ پەلـەوەرێکی گەورەیە بە ڕەنگی ڕەشی ئاماڵ سەوز و سپی، پۆپە تەسک، پا درێژ و باڵ پان و خڕ.

**خـروس‌بـازی** / xurûsbāzî, xorûs-/:اسم. کەڵەشێرەجـەنگێ؛ شەڕەکەڵـەباب؛ کەڵەشـێرە جەنگانی؛ گەمەیەکە دوو کەڵەشێر ئەدەنە گژی یەکتردا، هەرکامیان کـشایە دواوە، خاوەنەکـەی

دایناوه. هەروەها: **خروس‌باز**

**خروسخوان** / xurûsxān, xorûs- /: اسم. *[کنایی]* بەرەبەیان؛ گەردی بەیانی؛ سیسان؛ سەلای سوح؛ مەلابانگدان؛ نەماژی؛ بەیانی زوو ‹خروسخوان بود کە راه افتادیم: بەرەبەیان بوو رێ‌کەوتین›.

**خروس‌قندی** / xorûsqandî, xorûs- ، ـها/: [فارسی/ معرب از سنسکریت] اسم. گۆچان‌قەن؛ جۆرێ ئاونەوات لە بیچمی کەڵەباب.

**خروسک**/ xurûsak, xorûsak /: اسم. ١. *[پزشکی]* خرووسەک؛ خورۆسەک؛ خرووزەک؛ خوروزەک؛ خرزەک؛ خەندخەندوک؛ لارنژیت؛ نەخۆشیەکی سپیەلاکە کۆخەی وشک و سەختی لەگەڵدایە ٢. *[مکانیک]* خرۆسەک؛ مۆرەی خرۆسی ☜ **مهره**

**خروسه** / xurûse, xorûse /: اسم. بەلۆکە؛ کوڕکە؛ میتکە؛ قیتکە؛ نێور؛ چیلکە؛ تیتلک؛ دوو پەلە گۆشتی لای سەرووی شەرمی ژن.

**خروش** / xorûš , xurûš ، ـها/: اسم. *[ادبی]* گوڕە؛ هاوار؛ خرۆش؛ خورۆش؛ مرۆش: ١. هەرا؛ قاڵ؛ قیڕە؛ قیڕە؛ قوورە؛ فەرە؛ ناڵەی بەرز ‹خروشی از آن خانە برخاست: هاوارێ لەو ماڵەوە هەستا› ٢. *[مجازی]* گرم؛ گرمە؛ نەعرەتە؛ هەرا و هەنگامە.

**خروشان**[1] / xorûšān, xurûšān /: صفت. *[ادبی]* بەخور؛ بەگوڕ؛ بەتاو ‹رود خروشان: چەمی بەخور›.

**خروشان**[2]: قید. *[ادبی]* بەخور؛ بەگوڕ و تاو؛ لە تاو خوڕیندا ‹خروشان و غران پیش آمد: بەخور و گرمەوە هاتە پێشەوە›.

**خروشیدن** / xorûšîdan /: مصدر. لازم. *[ادبی]* //**خروشیدی**: خورۆشایت؛ **می‌خروشی**: دەخرۆشی؛ **بخروش**: بخورۆشە// خورۆشان؛ خرۆشیان؛ مرۆشیان؛ گوڕان؛ خورۆشیەی؛ خورۆشیای: ١. گوڕاندن؛ خورۆشان؛ بە قەو و زۆرتر تووڕەییەوە هاوارکردن ٢. *[مجازی]* گرماندن؛ گرمنەی؛ گرمنای؛ گورمین.

■ صفت فاعلی: **خروشنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **خروشیده** (خورۆشاو)/ مصدر منفی: **نَخروشیدن** (نەخورۆشان)

**خریت** / xarîyyat ، ـها/: (!) [فارسی/ عربی]/اسم. *[مجازی]* کەریەتی؛ هەریەتی؛ گەوجی؛ گێژی؛ لاژگی؛ نەزانکاری.

▣ **خریت کردن**: *[مجازی]* کەریەتی کردن؛ گەوجی‌کردن؛ نەزانکاری‌کردن ‹خریت کرد آن خانە را فروخت: کەریەتی‌کرد ئەو خانووەی فرۆشت›.

**خود را بە خریت زدن**: *[تعریض]* خۆ لەو بارەکەی دان؛ خۆی لێ گێل کردن؛ خۆ لە کەری دان؛ خۆ بە گەوج نیشان دان.

**خرید** / xarîd ، ـها/: اسم. ١. کار یان ڕەوتی سەندن؛ سەنن؛ ئەسەی؛ ئەستەی؛ سانەی؛ کڕین؛ کڕان ‹خرید اقساطی: سەندنی پاژـپاژی› ٢. سەنراو؛ کڕدراو؛ کاڵا یا شتومەکێ کە پارەی دراوە و هەڵگیراوە ‹خریدت را نشانم بدە ببینم: سەنراوەکەت پیشانم دە بزانم›.

▣ **خرید اقساطی**: سەندنی پاژەـپاژی؛ سەندنێ کە پارەکەی قرتان‌ـقرتان بدرێتەوە.

**خرید نسیە**: قەرز؛ سەندن بە قەرز و قۆڵە؛ سەندنێ کە پاش ماوەیەک پارەکەی بدرێتەوە.

**خرید نقد**: هیشکە؛ سەندنێ‌کە پارەکەی لە کاتی سەندنیدا بدرێت.

▣ **خرید رفتن**: ڕۆیشتن/ چوونە شت کڕین؛ بۆ کڕین چوون؛ بۆ شت کڕین چوون؛ بۆ شت سەندن چوونە دوکان و بازاڕەوە ‹دیروز رفتە بودم خرید: دوێنێ ڕۆیشتبوومە شت کڕین›.

**خرید کردن**: شت سەندن؛ شت‌کڕین؛ بازار کرن ‹ما از آن مغازە خرید می‌کنیم: ئێمە لەو دووکانە شت دەسینین›.

**خریدار**[1] / xarîdār ، ـها؛ ـان/: اسم. کڕیار؛

سەنیار؛ بسێن؛ پسێن؛ ئەسان؛ کڕینۆخ؛ ئەوی شت دەکڕێ؛ کەسێ کە شت ئەسێنێ. بەرانبەر: **فروشنده** ‹پرداخت هزینه‌ها به عهده‌ی خریدار است: دانی خەرجەکان لە مل کڕیارە›.

⊡ **خریدار داشتن**: *[مجازی]* کڕیار هەبوون؛ بازاڕ هەبوون؛ باو بوون؛ ڕۆژ هەبوون؛ بابەتی سەرنج بوون ‹این حرفها اینجا خریدار ندارد: ئەم قسانە لێرەدا کڕیاریان نیە›.

**خریدار**[2]: *صفت.* کڕیار؛ بسێن؛ سەنیار؛ ئەسان؛ کڕینۆخ؛ بە تامەزرۆیی و هۆگری بۆ سەندنی شتێ ‹شما خریدار نیستی، پس بی‌خود چانه می‌زنی: ئەتۆ کڕیار نی، ئەدی بێ‌هۆ چەقە دەکەی›.

**خریداری** / xarîdārî/: *اسم.* ١. کڕیاری؛ دۆخ یان چۆنیەتی کڕیار بوون ‹به چشم خریداری نگاهش می‌کرد: بە چاوی کڕیاریەوە بۆی دەڕوانی› ٢. کڕین؛ سەندن ‹آنها را برای بچه‌هایش خریداری کرده بود: ئەوانەی بۆ منداڵەکانی کڕیبوو›.

**خریدن** / xarîdan/: *مصدر. متعدی.* // **خریدی**: سەندت؛ **می‌خری**: دەسێنی؛ **بخر**: بسێنە// سەندن؛ کڕین؛ سانن؛ ساندن؛ سەنن؛ سەنین؛ سانەی؛ سەنای؛ سانتەی؛ ئەسەی؛ ئەسای؛ هێرناییینە؛ گرەوتش؛ هەری نایش: ١. بوونە خاوەنی شتێک بە دانی نرخەکەی ٢. *[مجازی]* سەندنەوە؛ کڕینەوە؛ ئەدایوە؛ لە زەرەر لێکەوتن و تێداچوون ڕزگارکردن ‹آبروی کسی را خریدن: ئاوەڕووی کەسێ سەندنەوە› ٣. *[مجازی]* قەبووڵ کردن؛ وەرگرتن؛ بواراکردن؛ بە ئەستۆگرتن ‹زحمتی را به جان خریدن: زەحمەتێک بە گیان کڕین›. هەروەها: **خریدنی**

■ صفت مفعولی: **خریده** (سەنراو)/ مصدر منفی: **نَخریدن** (نەسەندن)

**خز** / xaz، ـها/: [عربی]/*اسم.* قووز: ١. بەوەرز؛ کووژە؛ کویژک؛ کوربەش؛ گیانەوەرێکی ڕاوی گوهاندار و گۆشتخۆرە، پێستی پشتی لە هاویناندا قاوەیی و ژێر سکی سپیە و لە زستاندا گشتی سپی دەبێتەوە و تەنیا جووچکەی بۆر دەمێنێتەوە، کە لەم کاتەدا «قاقم»ی پێ ئێژن ٢. خەز؛ پێستی ئەم گیانەوەرە و گیانەوەرانی تر(ی وەک، ڕێوی، کەروێشک، گورگ، سمۆرە و...) کە موویان نەرم و بریقەدار و تیسکنە و هەر بەو هۆیەوە کۆت، پاڵتاو، کڵاو، کیف و ئەم جۆرە شتانەی لێ دروست دەکەن.

**خزان**[1] / xazān/: *اسم. [ادبی]* خەزان؛ خەزام؛ پاییز؛ پەیز؛ گەڵاڕێزان؛ خەزەڵوەر؛ گازەل؛ کڕی دوای هاوین.

⊡ **خزان کردن**: خەزەڵ وەراندن؛ خەزان کردن/ کەردەی؛ گەڵاڕێزان کردن؛ زەرد هەڵگەڕان و داوەرانی گەڵای داران.

**خزان**[2]: *قید. [ادبی]* بە خشکە؛ بە خلیسک؛ بە خلیشک؛ بە خلیزک؛ بە خزین؛ بە خسان؛ بە خشکان ‹مار خزان گریخت: مارەکە بە خشکە هەڵات›.

**خزانه** / xazāne، ـها/: [عربی]/*اسم.* ١. خەزانە؛ خەزنە؛ خەزێنە؛ گەنجینە؛ گەنجخانە؛ هۆدە یان خانوویەک کە پارە، پیتەوا و شتومەکی گرانی تێدا ڕادەگرن ‹خزانه‌ی بانک: گەنجینەی بانک› ٢. شەتڵگە؛ شەتڵجاڕ؛ زەوینێک کە شەتڵ یان نەمامی بۆ کشت و کاڵ و دارناشتن تێیدا بار دێنن ٣. جێی تێنانی گولە و فیشەک لە چەک بە تایبەت تۆپدا ٤. کۆگە؛ خەزنە؛ خەزینە ‹خزانه‌ی اسناد تاریخی: کۆگەی بەڵگەگەلی مێژوویی›.

**خزانه‌دار** / xazānedār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* گەنجینەوان؛ خەزێنەدار؛ خەزنەدار؛ کەسێ کە سەرپەرشتی و ئاگاداری کردن لە پارە و بەڵگەی بایەخداری دامەزراوەیەکی وەئەستۆە.

**خزانه‌داری** / xazānedārî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* گەنجینەوانی؛ خەزێنەداری؛ گەنجبانی؛ دامەزراوەیەک کە ڕاگرتنی حەساوی داهات و خەرجی دەوڵەتی بە ئەستۆە.

**خزاین** / xazāyen/: [عربی] جمعِ ☜ **خزینه**

**خـزر** / xazar/: اسم. خـەزەر: ۱. هـۆزی سـپی پێستی ئاریـایی دانیـشتووی بـاکووری دەریـای خەزەر، کە لە سەدەی ۱۰ی زایینیـەوە بـەهۆی هێرشی هۆز و بەرەی ئاسیای ناوەنـدی پـەرژ و بڵاو بوون و لە هۆزەکانی‌تردا توانەوە ۲. /ها؛ ـان/ هەرکام لە کەسەکانی ئەو هۆزە.

**خزعبلات** / xoza'balāt/: [عربی]اسم. [ادبی] ڤرت و ڤین؛ پـڕ و پـووچ؛ حەلـەق‌مەلـەق؛ هەلـیت و پەلیت؛ فشقیات؛ قسەی بێ‌مانا و هیچ‌وپووچ.

**خزنــدگان** / xazandegān/: اسـم. خزۆکــان؛ تاقمێ لە گیانەوەرانی مۆرەداری خوێنسارد، بـە پێستی زرو و زۆرتر پوولەکەدارەوە، بێ‌پـەڕ یـان موو و تووک (وەک مارمێلکە، تیمساح، مار، کیسەڵ و...).

**خزنـده**[1] / xazande ، ـها؛ ـگان/: اسم. خـزۆک؛ مـارموور؛ هـەر یەکـە لـە گیانـەوەرانی ڕیـزی خزۆکان.

**خزنـده**[2]: صفت. خـەزۆک؛ خـزۆک؛ خـشۆک؛ خشنە؛ خزنە: ۱. بەتایبەتمەنـدی یـان توانـایی خزینەوە ۲. [مجـازی] بـە بـزوان یـان ڕەوتێکـی هێدیکایی و نادیارەوە.

**خزه** / xaze ، ـها؛ ـگان/: اسم. کەز؛ کەژاو؛ کەڤس؛ کووز؛ خورپەجنە؛ خورپەجندۆکە؛ کەفز؛ کـەفزە؛ قەبزە؛ قەوزە؛ قۆزە؛ قۆزەقرواق؛ گووبۆق؛ گاوەک؛ جۆلە؛ ناوی گشتی ئەو ڕووەکانە وا زۆرتر لە جێی شێدار و تاریک یان لە ئاوی مەنددا دەڕوێن.

**خزه شناسی** / xazešenāsî/: اسم. کەزناسی؛ لقێ لە زانستی گیاناسی کە تایبەتی ناسین، لێڕوانین و ڕیزبەندی کەزەگەلە. هەروەها: **خزه‌شناس**

**خزیـدن** / xazîdan/: مـصدر. لازم. // **خزیــدی:** خزایـت؛ **می‌خزی:** دەخـزی؛ **بخـز:** بخـزە// خـزین؛ خزەی؛ خزای؛ ڕاخووشـین؛ خزیـان؛ ڕاخـشین؛ ڕاخوشین؛ خـشان؛ خـشیان؛ خوشـین؛ خـزان؛ خوشــیان؛ خــشکان؛ شێــڵەهان؛ شێــڵەهین؛ کاشکرن؛ ململـین؛ جینگـڵدان: ۱. خلیـسکان؛ لەخشای؛ جووڵان بە هۆی کـشاندنی لـەش بـە زەویدا ‹دویدن مورچه‌ها و خزیدن مارها: دەرچـوونی مێرووان و خـزینی مـاران› ۲. [مجـازی] فـەرزین؛ یـەکجار خـاو و بـە ئـارامی بـزوان. هـەروەها: **خزیدنی**

■ صفت فاعلی: **خزنده** (خـزۆک)/ صفت مفعولی: **خزیده** (خزاو)/ مصدر منفی: **نخزیدن** (نەخزان)

**خزیــده** / xazîde/: قیـد. [گفتـاری] بەخــشکە؛ بەخشکان؛ بە خزکان؛ بە خلیسک؛ بەلەخش؛ لە خلیزک؛ لە حاڵی خزاندا ‹خزیده راه مـی‌رفت: بـە خشکە دەچوو›.

**خزینه** / xazîne ، ـها/: [از عربـی]اسم. خەزێنـە: ۱. جورنە؛ کورن؛ حەوزۆکەی حەمام کـە ئـاوی گەرمی بۆ خۆ شتن تێـدەکرا ۲. /خزاین/ کۆگـە؛ کۆگا ۳. چاڵی سەر ئامرازێـک کـە پێچـی تێـدا جێ‌دەگرێ.

**خس** / xas ، ـها/: اسم. گـەرش؛ کـرش؛ پـووش؛ چیلکە؛ پویش؛ گزرە؛ قرشک؛ پـەلاش؛ گلـیش؛ درک و داڵ؛ بەشێکی چکۆلە لـە ئالـفی وشـک، پووش، کا و...

**خسارات** / xesārāt, xasārāt/: [عربی] جمـعِ ☜ **خسارت**

**خسارت** / xesārat, xasārat ، ـها؛ خسارات/: [عربی] اسم. ۱. ☜ **آسیب** ۲. زیـان؛ زەرەر ‹زیـان مـالی: زیانـی مالی› ۳. [گفتاری] تاوان؛ پارەیەک کە لـە بەرامبـەر زیانـەوە وەردەگـیردرێ یـان دەدرێ ‹شیشه را شکستی، باید خسارت بـدهی: شووشـەکەت شکاند، دەبێ تاوان بدەی›.

▣ **خسارت دادن:** [گفتاری] زەرە دان؛ تـاوان دان؛ جەریمە بژاردن.

**خسارت دیدن:** زیان لێ‌کەوتن؛ زەرەر کـردن: زەرەر دیتن ‹ما در آن معامله خیلی خسارت دیدیم: ئێمە لەو مامەڵەدا زۆرمان زیان لێ کەوت›.

**خسارت زدن:** زیان گەیاندن؛ زەرەر لێدان.

**خسارت گرفتن**: */گفتاری/* پێ‌بژاردن؛ پێ ژمارتن؛ پێ وژاردن؛ پنەوجارەی؛ وەرگرتنی تاوانە ‹آن شیشه را که شکستی، خسارتش را می‌گیرم: ئەو شووشە شکاندت پیتی دەبژێرم›.

**خسارت وارد کردن**: زیان پێ گەیاندن؛ خەسار لێدان؛ لەتمە لێدان ‹جنگ خیلی به ما خسارت وارد کرد: شەڕ ئێجگار زەرەی پێ گەیاندین›. هەروەها: **خسارت وارد شدن**

**خساست** / xesāsat, xasāsat/: [عربی]*/اسم*. ڕژدی؛ لەجەری؛ چرووکی؛ چنۆکی؛ پیسکەیی؛ بەرچاوتەنگی؛ بەرچاوگیراوی؛ دەس‌قووچاوی.

**خسبیدن** / xosbîdan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* //**خسبیدی**: نووستی؛ **می خسبی**: دەنووی؛ **بخسب**: بنوو// نووستن؛ نڤستن؛ خەوتن؛ خەفتن؛ وتەی؛ خەپیتەکردن.

■ صفت مفعولی: **خسبیده** (خەوتوو)/ مصدر منفی: **نخسبیدن** (نەخەوتن)

**خست** / xessat/: [عربی]*/اسم. [ادبی]* ڕژدی؛ چرووکی؛ نگریسی؛ چنۆکی؛ گناسی؛ قرتنی؛ پیسکەیی؛ نان‌کووری؛ دەست قووچاوی؛ لەجەری؛ وشکەهەوری ‹خست تنها این نیست که کس را چیزی ندهی: ڕژدی هەر ئەوە نیە شتێ نەدەی بە کەسێ›.

**خستگی** / xastegî/: *اسم*. شەکەتی؛ ماندوویەتی؛ ماندوویی؛ ماندوێتی؛ مانیایی؛ مانیاگی؛ مانگی؛ مەنگی؛ هیلاکی؛ هەلەکەتی؛ خەسەیی؛ پاکەمی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ماندوو بوون ‹کارش خستگی می‌آورد: کارەکەی شەکەتی دێنێ›.

▣ **خستگی در کردن**: شەکەتی دەرکردن؛ وچان گرتن؛ حەسانەوە؛ وریندان؛ پیش‌دان؛ ئەوەسیەی؛ سیایوە ‹دنبال جایی می‌گشتیم اندکی خستگی در کنیم: بە شوێن جێگایەکدا بووین هێندێ شەکەتی دەرکەین›.

**خستگی کسی در رفتن**: ماندوویی کەسێک دەرچوون؛ شەکەتی کەسێ دەرچوون؛ حەسانەوە؛ مانیایۆ یۆی بەرشیەی؛ لەش ڕەحەت بوون؛ سیایوە ‹کمی بنشین خستگی‌ات دربرود: هێندێک دانیشە ماندوویت دەرچێ›.

**خستن** / xastan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* ۱. برینەدار کردن؛ زامارکردن؛ زەخمارکردن؛ کەسیرە خستن ۲. ڕووکاندن؛ ڕووشاندن؛ ڕنیەی ۳. زیان پێ‌گەیاندن؛ زەرەر لێدان.

■ صفت مفعولی: **خسته** (ماندوو)

**خسته** / xaste/: *صفت*. ماندوو؛ مانوو؛ میەری؛ مانی؛ مانێ؛ مانیا؛ میەنی؛ واپڕ؛ خەستە؛ خەسە: ۱. ـها؛ ـگان/ مانیاو؛ ماندی؛ ماندگ؛ ماندک؛ مانیاگ؛ مانگ؛ مینگ؛ هەڕەگ؛ مەنە؛ مەند؛ دەوخ؛ وەستاو؛ وەستی؛ وەستە؛ مەلەت؛ شەکەت؛ شەلەنگ؛ کەشەنگ؛ کەشەن؛ هیلاک؛ هەلەکەت؛ هەلاک؛ شەقی؛ لوبڕ؛ ڤابڕ؛ گها؛ ئاس؛ ڤەرمل؛ ژاکاو بە هۆی درێژەپێدانی کارێکەوە ‹پس از چهار ساعت کار خسته شدم: لە دوای چوار سەعات کار ماندوو بووم› ۲. بێزار؛ وەڕەز؛ وێڕس؛ زویر؛ ئاس ‹از زندگی خسته بود: لە ژیان ماندوو بوو› ۳. *[ادبی]* ڕەنجاو؛ شەمزاو؛ پەشێو ‹با این سرزنشها مرا خسته کردی: بەم سەرکۆنەکردنتە ماندووت کردم›.

▣ **خسته شدن**: ماندوو بوون؛ ڤەرملین؛ فل بوون؛ وەستان؛ وەستیان؛ قەرملین؛ قەرمین؛ لەبکین؛ دەوخین؛ جەفلین؛ ئەرخین؛ بەتلین؛ هەفان؛ ئژپا کەفتن؛ لوبڕ بوون؛ مانیەی.

**خسته کردن**: ماندووکردن؛ وەستاندن؛ قەرملاندن؛ قەرماندن؛ لەبکاندن؛ دەوخاندن؛ جەفلاندن؛ ئەرخاندن؛ بەتلاندن؛ هەفاندن؛ بەعجاندن؛ ماننای؛ خەسەکردن؛ ئاس کرن.

**خسته‌جان** / xastecān/: *صفت. [ادبی]* ژار؛ کوتیاگ؛ وەڕەز و خەمین.

**خسته‌خانه** / xastexāne، ـها/: *اسم. [نامتداول]* خەستەخانە؛ نەخۆشخانە؛ دامەزراوەیێ کە چاودێری لە نەخۆشانی سەرەمەرگی دەکا.

**خسته‌دل** / xastedel ، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* دڵـماندوو؛ دڵـشکاو؛ پـه‌ژار؛ ژاکـاو؛ خـه‌مبار؛ دڵته‌نگ و خه‌مین.

**خسته و مرده** / xaste-vo-morde/: *قید. [گفتاری]* شه‌که‌ت و ماندوو؛ هیلاک و که‌له‌لا؛ شـه‌که‌ت و هه‌ڵه‌که‌ت؛ سیس و کز؛ مانیـا و مـردی؛ مانیـا و مـه‌رده ‹ساعت ١٠ شب، خسته و مرده به خانه برگشتیم: کـاتژمێر ١٠ی شـه‌و، شـه‌که‌ت و مانـدوو گه‌راینه‌وه بۆ ماڵ›.

**خس ـ خس** / xesxes/: *صوت.* خشه خش؛ خیسه‌خیس؛ خیزه‌خیز؛ نیخه‌نیخ؛ سـیخه‌سـیخ؛ گرخ؛ ده‌نگی هه‌ناسه له کاتی چاک کارنه‌کردنی ده‌زگای هه‌ناسه‌داندا (وه‌ک تـه‌نگی نه‌فـه‌س یـان گیراوی گه‌روو).

**خسران** / xosrān/: [عربی] *اسم. [ادبی]* زیـان؛ وه‌زه‌نگ؛ گه‌زه‌ن؛ زه‌ره‌ر.

**خسوف** / xusûf, xosûf/: [عربی] *اسم.* مانـگ‌گـیران؛ مانـگ‌گیریـه‌ی؛ مـان‌گـیران؛ هێڤ‌گرتن؛ گـیرانی مانـگ؛ ماگرتـه؛ ماگیرسـه؛ ماگیرس؛ نادیار بوونی مانگ؛ دۆخـی جێگـرتنی گۆی زه‌وی له نێـوان مانـگ و خـۆردا و تاریـک بوونی مانگ.

▣ **خسوف جزئی:** مانگ‌گـیرانی به‌شـی؛ دۆخـی تاریک بوونی به‌شێ له مانگ.

**خسوف کلی:** مانـگ گـیرانی گـشتی؛ دۆخـی تاریک‌بوونی گشت یان زۆربه‌ی ڕووی مانگ.

**خـسوف نـامرئی:** مانـگ گـیرانی نادیـار؛ مانگ‌گیرانێ که له به‌ر ڕوونی هـه‌وا بـه چـاو نابینرێ.

**خسیس** / xasîs ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* چکووس؛ ڕژد؛ له‌چه‌ر؛ چرووک؛ کوورقۆش؛ ده‌س‌قووچـاو؛ ده‌س‌نوقیای؛ چوریک؛ نگـریس؛ نـه‌تڵ؛ بـزگیر؛ قـرتن؛ قیرسـیچم؛ قـومش؛ خـوس؛ کۆرنـان؛ نان‌کوور؛ به‌رچاوته‌نگ؛ چه‌وته‌نگ؛ وشـکه‌هه‌وه‌ڕ؛ به خوو و خده یان وازی خۆ پاراستن له خـه‌رج و دانی شت به دیتران ‹شوهرم خیلی خسیس است: مێرده‌که‌م زۆر چکووسه›.

**خسیسی** / xasîsî/: [عربی] *صفت.* چکووسـی؛ ڕژدی؛ ده‌س‌قووچـاوی؛ دۆخ یـا چۆنـاوچۆنی چکووس و به‌رچاوتـه‌نگ بـوون ‹اگـر نمونـه‌ای از خسیسی او بگویم، باور نمی‌کنید: ئه‌گـه‌ر وێنـه‌یێک لـه چکووسـی ئـه‌و بێـژم، بـاوه‌ڕ ناکـه‌ن›. هـه‌روه‌ها: **خسیسی کردن**

**خـش** / xaš/: *اسم.* ١. ڕووش؛ ڕیـش؛ ڕویـش؛ خاشه؛ ڕووکه؛ تیڕ؛ شوێنه باریکه‌یـه‌ک بـه سـه‌ر ڕوویه‌کی سافدا ‹مواظب باش روی آینه خش نیفتد: وریا به ئاوێنه‌که ڕووشـی تـێ نه‌کـه‌وێ› ٢. خـشه؛ کشه؛ شه‌په؛ گرخ؛ ئاڵۆزی له ده‌نگـدا (به‌تایبـه‌ت ده‌نگی مرۆ) ‹صدایش کمی خش داشت: ده‌نگی که‌مێ خشه‌ی بوو›.

**خشاب** / xašāb ، ـها/: *اسم.* خه‌شاو؛ خه‌شـاب: ١. ساجۆڕ؛ ساجوور؛ شـاجوور؛ سـه‌مه‌ندۆگ؛ ده‌راغ؛ جێیه‌ک بۆ هه‌ندێ گولله له خه‌زێنـه‌ی چـه‌کی گه‌رمـدا ٢. جـۆرێ جێـی فـیلم کـه له‌گـه‌ڵ فیلمه‌که له دووربیندا جێی ده‌که‌نه‌وه.

**خـشابی** / xašābî/: *صفت.* خه‌شـاوی: ١. بـه بیچمی خه‌شاو ٢. خاوه‌ن خه‌شاو.

**خشت** / xešt ، ـها/: *اسم.* خشت؛ خشته؛ خێشت: ١. که‌رپووچ؛ که‌رپیچ؛ ئاوماڵ؛ لـه شـتومـه‌کی خانوبه‌ره‌کردنه‌وه به شێوه‌ی بڕگه‌گه‌لی ته‌خت و چوارگۆشه له گڵ که ده‌نێو قالب ڕژاوه و له بـه‌ر خـۆره‌وه وشـک کراوه‌تـه‌وه ٢. لبنـه؛ لگـبن؛ ئاجۆری کـاڵ کـه ده‌بـێ دوایـی بخرێتـه نێـو کـووره‌وه ٣. لـه خاڵـگه‌لی وه‌رەق، بـه بیچمـی خشت.

▣ **خشت بر دریا/ آب زدن:** *[مجازی]* ئاو لـه دنگـا کوتان؛ ئاو جـاوین؛ ئـاو بـه بێژنگدا دان؛ ئـاو هه‌سه‌وکردن؛ با شه‌ن‌کردن؛ کوچک کولاندن؛ ئاسـنی سـارد کوتـان؛ گـوێز بـه گومبـه‌زا هه‌ڵخستن؛ کاری بێ‌بایه‌خ و فیڕۆکردن.

**خشت روی خشت بند نبودن:** *[مجازی]* ئاداری بە سەر پادارەوە نەمان؛ داری بەسەر پەردوویەوە نەهێشتن؛ کوچک لە بان کوچکەوە نەوێسیان؛ بەرد لە سەر هەردەوە نەمان؛ بێ سەر و بەر بوون و تێکچوونی مرێس و قانوون ‹اگر هر کسی بیاید و قانونی بتراشد، آن‌وقت خشت روی خشت بند نمی‌شود: ئەگەر هەر کەسێک بێت و قانوونێک داتاشێ، ئەمجار ئاداری بە سەر پادارەوە نامێنێ›.

**خشت روی خشت گذاشتن:** *[کنایی]* بەرد نانە سەر بەردەوە؛ ماڵ‌کردنەوە.

**خشت زدن:** خشت برین؛ خشت پێژان؛ خشت بێژین؛ دەقاڵب کردنی قوڕ بۆ کەرپووچ.

**بر خشت افتادن:** *[مجازی]* زان؛ لە دایک بوون؛ هاتنە دنیاوە؛ چاو بە دنیا کەوتن؛ چاو بە دنیا هەڵێنان.

**سر خشت نشستن:** *[مجازی]* مناڵ خستنەوە؛ مناڵ بوون؛ منداڵ هێنانە دونیاوە.

**خشت‌خرابه** / xeštxarābe/: [فارسی/ عربی]*اسم.* *[تعریض]* کەلاوەکۆن؛ماڵەکۆن؛ وێرانەماڵ؛ کەلاڕ؛ مشەمڕ ‹تو به این خشت‌خرابه می‌گویی خانه؟!: تۆ بەم کەلاوە کۆنە ئێژی ماڵ؟!›.

**خشت‌زن** / xeštzan/ ☜ **خشتمال**

**خشتک** / xeštak ، ـها/: *اسم.* نێفەک؛ نەفەک؛ نێفۆک؛ نافەک؛ تەلینگ؛ چوارچبووغ؛ چوارچابووغ؛ گرۆڵ؛ گورۆڵ؛ چوارچاک؛ چوارخشتەک؛ هیفگە؛ بەچ شەلوار؛ پارچەیەکی چوارگۆشە کە لە نێوان دوو لنگی شواڵدا دەیدوورێنن.

▣ **خشتک کسی را پاره کردن:** *[کنایی، مستهجن]* دەرپێی کەسێ داکەندن؛ شواڵ کەسێ لە پێی دەرهێنان؛ کەسێک بێ‌ئابڕوو کردن یان بە توندی تۆڵەی لێ ساندنەوە.

**خشتمال** / xeštmāl ، ـها؛ ـان/: *اسم.* خشت‌ماڵ؛ خشت‌بڕ؛ کەسێ کە خشت دروست دەکا: **خشت‌زن**

**خشتمالی** / xeštmālî/: *اسم.* خشت‌بڕی؛ خشت‌ماڵی: ١. کار یان ڕەوتی لێدانی خشت ٢. کاری خشت‌بڕ.

**خشتی** / xeštî/: *صفت.* خشتی: ١. خشتین؛ چێ‌بوو لە خشت ‹دیوار خشتی: دیواری خشتی› ٢. بە بیچم یان نەخشی چوارگۆشە ‹کاغذ خشتی: کاغەزی خشتی› ٣. قطع خشتی، **قطع**

**خشخاش** / xašxāš ، ـها/: *اسم.* خاشخاش؛ خاشخاشک؛ خشخاش؛ ڕەبەنۆک؛ مەنگەگیا؛ سەبیلەگیا؛ خاشخاشکە؛ خاشخاشەک؛ گیایێکی ئالفی بە گەڵای گەورە و نەرم و ڕۆشن، گوڵی گەورەی سپی و سوور و سوورکاڵ یان بەنەوشەوە کە شیلەکەی دەکرێتە تریاک.

**خشدار** / xašdār/: *صفت.* خشەدار؛ کشەدار؛ گرخن؛ بە شەپە ‹صدای خشدار: دەنگی خشەدار›.

**خش‌ـخش** / xešxeš/: *صوت.* خشەخش؛ خشە؛ دەنگی لێکدان و بە زەویدا کێشرانی شتی وشک و سووک.

**خشک** / xošk, xošg/: *صفت.* وشک؛ ویشک؛ ئیشک؛ هشک؛ هیشک؛ هوشک؛ هوسک؛ زوها؛ زوا؛ ناقەک؛ قرقۆک؛ هەوشان؛ زرا: ١. بێ‌ئاو ‹چشمه‌ی خشک: چاوگەی وشک› ٢. بێ‌تەڕی ‹چوب خشک: چێوی وشک› ٣. بێ‌دەلاندنی ئاسایی ‹پستان خشک: مەمکی وشک› ٤. بێ‌باران؛ کەم‌باران ‹سرزمین خشک: وڵاتی وشک› ٥. بێ‌سەرسەوزی و پاراوی‹درخت خشک: داری وشک› ٦. بێ‌نەرمی یان داهاتن بۆ باو خواردن ‹فنر خشک: فەنەری وشک› ٧. *[مجازی]* بە بارێکی ڕەسمی و نادۆستانەوە ‹رفتار خشک: ئاکاری وشک›.

▣ **خشک زدن:** وشک بوون: ١. ڕەق بوون؛ ڕەق بوونەوە/ بیەی؛ ڕچان؛ ڕچیان؛ بەستن ‹از شدت سرما خشکش زده بود: لە بەر تۆفی سەرمادا وشک ببوو› ٢. *[مجازی]* ماق‌مان؛ تووشی

سەرسووڕمانی زۆر هاتن ‹وقتی او را به آن حالت دیدم خشکم زد: کاتێ بەو حاڵەوە دیتم وشک بووم›.

**خشک شدن**: وشک بوون؛ کەرسین: ۱. وشک هەڵاتن؛ هەڵچۆڕان؛ گەرمخین؛ ئاو یان شۆی خۆ لە دەسدان ‹چاه خشک شده بود: بیرەکە وشک ببوو› ۲. ڕەق بوون؛ نەرمی خۆ لە دەسدان ‹گردنم خشک شد: ملم وشک بوو› ۳. ژاکیان؛ سیسیان؛ سیس هەڵگەڕان ‹بوتەی یاس خشک شد: بنە یاسەکە وشک بوو› ٤. ڕچیان ‹از سرما خشک شد: لە سەرمادا وشک بوو› ٥. ماقمان؛ دووچاری سەرسووڕمانی زۆر بوون ‹از تعجب خشک شدم: لە سەرسووڕماندا وشک بووم›.

**خشک کردن**: ۱. وشک کردنەوە؛ وشکەو کردن؛ ئاو یان شۆی شتێ گرتن ‹پیراهنم را شُست و خشک کرد: کراسەکەمی شۆرد و وشکی کردەوە› ۲. وشک کردن ‹مقداری انجیر خشک کردەام: هێندێک هەنجیرم وشک کردووە›.

**خشک و تر باهم سوختن**: *[کنایی]* تەڕ و وشک پێکەوە سووتان؛ هەموو تێکڕا سووتان یا گەزەن دیتن.

**خشک و تر را با هم سوزاندن**: *[کنایی]* تەڕ و وشک پێکەوە سووتاندن؛ گەزەن گەیاندن یا لە ناو بردنی باش و خراپ بێ جیاوازی.

**خشکار** / xoškār, xošgār/: *اسم.* ۱. ئاردێ کە سوێکەی نەگیردراوە ۲. *ـها/* جۆرێ شیرنی کە بە وەها ئاردێ چێ دەبێ.

**خشکاندن** / xoškāndan, xošgāndan/: *مصدر. متعدی.* //**خشکاندی**: هشکاندت؛ **می‌خشکانی**: دەهشکێنی؛ **بخشکان**: بهشکێنە// هشکاندن؛ ئیشکاندن: ۱. وشک کردن؛ داچۆڕاندن؛ چرمساندن؛ گەرمخاندن؛ بەیین؛ ئاو یان تەڕایی شتێ یان شوێنێک لە بەین بردن ‹چاه را خشکاندن: بیر هشکاندن› ۲. وشک کردن؛ ژاکاندن؛ سیس کردن؛ چرمساندن؛ چرچاندنی گیا ‹یک هفته نبودم، همه گلها را خشکاندی؟: حەفتەیەک نەبووم، گشت گوڵەکانت وشک کرد؟› ۳. *[مجازی]* بنەبڕ کردن؛ قڕکردن؛ قڕ تێخستن؛ یەکجاری لە ناو بردنی شتێ ‹ریشەی فقیری را خشکاندن: ڕیشەی نەداری هشکاندن›. هەروەها: **خشکاندنی**

■ صفت فاعلی: **خشکاننده** (هشکێنەر)/ صفت مفعولی: **خشکانده** (هشکێنراو)/ مصدر منفی: **نَخشکاندن** (نەهشکاندن)

**خشک‌اندیش** / xoškandîš, xošg-/ ، ـها؛ ـان/: *صفت. [مجازی]* وشکەمێشک؛ بیرکورت؛ بە خوو و خدە یان وازی بیر وشکیەوە.

**خشک‌اندیشی** / xoškandîšî, xošg-/ ، ـها/: *اسم. [مجازی]* وشکەمێشکی؛ مێشکوشکی؛ بیرکورتی؛ کار یان ڕەوتی بیرکردنەوە لە ڕووی خوو و باوەڕی فیکری پێشووەوە بە بێ بەرچاو گرتنی بیر و بۆچوونی تر.

**خشکبار** / xoškbār, xošg-/: *اسم.* وشکەبار؛ وشکەبەر؛ میوەی ئیشکەوە کراو وەک: هەنجیر و مێوژ و قەیسی و... یان بۆ خۆی وشک وەک: گوێز و بادام و پستە و...

**خشک‌دست** / xoškdast/: *صفت. [مجازی]* دەستقووچاو؛ ڕژد؛ چرووک؛ چکووس.

**خشک‌رست**/ xoškrost, xošg-/ ☜ **خشکروی**

**خشکروی** / xoškrûy, xošg-/ ، ـان/: *صفت. [گیاه‌شناسی]* دەیمی؛ وشکەڕۆ؛ بە تایبەتمەندی یا توانستی ڕوان لە ناوچەگەلی ئیشکارۆ و بیاوانیدا و هەڵگرتنی ئاو لە ئەندامگەلیدا و خۆڕاگری لە هەمبەر وشکی درێژخایەنەوە: **خشک‌رُست**

**خشکسار** / xošksār, xošg-/ ، ـها/: *اسم.* وشکارۆ؛ وشکەڕۆ؛ ئیشکارۆ؛ وشکاژۆ؛ هشکارۆ؛ وشکانی؛ بێروون؛ ویرون؛ چۆڵی قاقڕ و بێئاو؛ زەوینی وشک کە ئاوی پێ نەگا.

**خشکسال** / xošksāl, xošg-/ ، ـها/: *اسم.*

وشکەساڵ؛ هشکەساڵ؛ هشکساڵ؛ ڕەشەساڵ؛ سیاساڵ؛ ئیشکەساڵ؛ ساڵی بێباران، یا خود کەمباران. بەرانبەر: **آبسال**

**خشکسالی** / xošksālî, xošg-/: *اسم.* وشکەساڵی؛ ئیشکەساڵی؛ مەڵی؛ دۆخی نەبوون یان کەم بوونی بارانی ساڵانە.

**خشکشویی** / xoškšûyî, xošg-/: *اسم.* وشکشۆری: ۱. کار و ڕەوتی شۆردنی پارچە و گنج بە کەرەسەی کیمیاوی بە کەمێ ئاو یان بە بێئاو ۲. کەرەسەی تایبەتی ئەم کارە ۳. /ـها/ کارگایەک کە ئەم کارەی تێدا دەکرێ.

**خشک‌کن** / xoškon , xošk.kon, xošg-، ـها/: *اسم.* ۱. وشکەوکەر؛ وشکەوەکەر؛ ئامرازێ بۆ وشکەوکردنی شتێ ۲. زوانگ؛ زومانگ؛ نووسراو وشکەوکەر؛ کاغەزی پەمۆیی تووکن بۆ وشکەوکردنی مەرەکەف ۳. کەرەسەیەکی کارەبایی بۆ وشک‌کردنەوەی دەس یان دەم و چاو بە بایێکی گەرم و بەتەوژم.

**خشک‌مغز** / xoškmaqz, xošg-/: *صفت. [مجازی]* مێشک‌وشک؛ دڵ‌ڤەرسیای: ۱. خاوەن زەینێکی وا نەتوانێ ئەندێشەگەلی تازە وەربگرێ ۲. بەبێ هێزی زەینی بۆ نوێکاری و نوێ بیرکردنەوە.

**خشکنای** / xošknāy, xošg-/: *اسم.* قورگ؛ قورقوڕانچە؛ قورقوڕانچک؛ قوڕقوڕاگە.

**خشک و خالی** / xošk-o-xālî, xošg-/: [فارسی/ عربی] *صفت.* خت و خاڵی؛ هاڵی و پەتێلا؛ هاڵی و هەوێلا؛ بێ‌هیچ شتێکی‌تر ‹اتاق خشک‌وخالی؛ سلام خشک‌وخالی: ژووری خت و خاڵی؛ سڵاوی هاڵی و پەتێلا›.

**خشکه**[1] / xoške, xošge/: *اسم.* ۱. شاتە؛ جۆرێ نان کە لە کاتی پێژاندا وەکوو بسکویت وشکی دەکەنەوە ۲. وشکە؛ جۆرێ پۆڵای سەخت و بێئاو کە لە قالب‌سازیدا بە کار دەڕوا.

**خشکه**[2]: *صفت.* وشکە؛ هیشکە: ۱. وشک؛ ئیشک ‹توت خشکه: تووە وشکە› ۲. بە شێوەی نەخت و بێ هیچی‌تر ‹جیرەی خشکه: مووچەی هیشکە›.

**خشکه‌پز** / xoškepaz, xošge-، ـها؛ ـان/: *اسم.* ۱. شاتەپێژ؛ وشکەپێژ؛ کەسێ کە شاتە دەپێژێ ۲. نانەوا؛ کەسێ کە نان دەکا.

**خشکه‌پزی** / xoškepazî, xošge-/: *اسم.* شاتەپێژی؛ وشکەپێژی: ۱. کاری وشکەنان کردن ۲. /ـها/ نانەوایی وشکەپێژ.

**خشکه‌مقدس** / xoškemoqaddas, xošge-، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت. [مجازی]* وشکەسۆفی؛ خەرسۆفی؛ پێداگر لە بواری بیر و باوەڕی ئایینیدا، بە بێ بیرکردنەوە.

**خشکی** / xoškî, xošgî/: *اسم.* هشکی؛ وشکی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی وشک بوون ۲. /ـها/ وشکایی؛ هیشکانی؛ پشکانی؛ هیشکایی؛ وشکانی؛ ئیشکایی؛ هشکاتی؛ ڕەشایی؛ بەژ؛ بەشێک لە ڕووی زەوین کە ئاو دای‌نەگرتووە.

**خشکیدگی** / xoškîdegî, xošgîdegî/: *اسم.* وشکێتی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی وشک‌هەڵاتن؛ وشکەوەبوون ‹نوعی عنکبوت موجب خشکیدگی برگها می‌شود: جۆرێ جاڵجاڵۆکە دەبێتە هۆی وشک‌هەڵاتنی گەڵا›.

**خشکیدن** / xoškîdan, xošgîdan/: *مصدر. لازم.* // **خشکیدی**: هشکایت؛ **می‌خشکی**: دەهشکی؛ **بخشک**: بهشکە// هشکان؛ وشک بوون؛ وشک بیەی: ۱. چرمسین؛ ژاکیان؛ سیسیان ‹خشکیدن درخت: وشک‌بوونی دار› ۲. وشکەڵاتن؛ داچۆڕان؛ وشکاو هاتن؛ وشکاو داهاتن؛ لەناو چوونی ئاو یان تراویی‌تر ‹خشکیدن چاه: هشکیانی بیر› ۳. سفت بوونی ئەندامانی لەش ‹خشکیدن دست: وشکەڵاتنی دەست› ٤. *[گفتاری]* ڕەق بردنەوە؛ یەخ‌کردن؛ ڕچیان؛ وشک بوون لە سەرمادا ‹از سرما خشکیدن: لە سەرمادا هشکان› ٥. *[مجازی، گفتاری]* پەشۆکیان؛ ڕەپ وەستان؛ داکوتیان؛ واق وڕمان؛ واق مەنەی ‹از ترس سر جای خود خشکیدن: لە ترسان لە جێی خۆوە هشکان›. هەروەها:

**خشکیدنی**

■ صفت مفعولی: **خشکیده** (هشکاو)/ مصدر منفی: **نخشکیدن** (نەهشکان)

**خشکیده** / xoškîde, xošgîde/: *صفت. [گفتاری]* هشکاو؛ وشک بووگ؛ سیس؛ سیس‌بووگ ‹علف خشکیده؛ چاه خشکیده: ئالفی هشکاو؛ بیری هشکاو›.

**خشکیزی** / -xoškîzî, xošgî/: *صفت.* وشکەژی؛ بە تایبەتمەندی یان خووی ژیان لە وشکانیدا.

**خشم** / xašm/: *اسم. [ادبی]* ئاژر؛ خەزر؛ بەهەج؛ برووت؛ جونگ؛ شیپۆر؛ خشم؛ خەیدە: ۱. رق؛ قین؛ قینی؛ سێهە؛ سلی؛ هەیەجانی سەرچاوەگرتوو لە نارەزایی زۆر لە ئاست کەسێ یان شتێکەوە ۲. توورەیی؛ قەلسی؛ گڕ؛ نیشاندانی ئەو هەیەجانە.

⊡ **خشم خود را فرو خوردن:** پیش خواردنەوە؛ توورەیی خۆ دەرنەخستن؛ رقی خۆ خواردنەوە ‹هرچه آزارش دادند، خشم خود را فرو خورد و چیزی نگفت: هەرچی ئەزیەتیان کرد، پیشی خواردەوە و هیچی نەگوت›.

**خشم گرفتن:** توورە بوون؛ قەلس بوون؛ رق هەستان؛ هەڵچوون؛ توورەیی و نارەزایی خۆ دەربڕین ‹پادشاهی بر وزیر خود خشم گرفت: پاشایێک لە وەزیرەکەی توورە بوو›.

**خشم‌آلود** / xašmālûd/: *صفت.* خەزریو؛ بەهەجۆک؛ ڕک‌هەستاو؛ ڕک‌ئەستوور؛ قرم‌پر ‹صدای خشم‌آلود؛ چهرەی خشم‌آلود: دەنگی خەزریو؛ روومەتی بەهەجوک›.

**خشمگین** / xašmgîn/: *صفت.* گرگین؛ گڕژ؛ زویر؛ توورە؛ درژ؛ نارەحەت؛ رق‌هەستاو؛ ڕکین؛ قارس؛ خەیدی؛ قەلس؛ بەهەجۆک؛ بەقین؛ هێچی؛ هیج ‹صدای خشمگین؛ چهرەی خشمگین: دەنگی گرگین؛ رووی گرژ›. هەروەها: **خشمگین بودن؛ خشمگین شدن؛ خشمگین کردن**

**خشمناک** / xašmnāk/: *صفت.* ئاژری؛ گرگین؛ سڵ؛ توورە؛ قەلس؛ بەهەجۆک؛ رق هەستاو؛ بەرک؛ قەرس؛ جارز؛ قالس؛ ڕک‌هەستای؛ رق‌هەڵستاو؛ حێذز. هەروەها: **خشمناک بودن؛ خشمناک شدن؛ خشمناک کردن**

**خشن** / xašen/: [عربی] *صفت.* ۱. زبر؛ زرۆ؛ زرو؛ زوور؛ زڤر؛ زۆق؛ رووش؛ زێر؛ ئاژ؛ کونجڕ؛ بە روویەکی گرنج‌ـگرنج و نارێکەوە کە ئەگەر دەستی لێ بدەی، پێستی دەست ئازار بدا ‹پارچەی خشن: پارچەی زرۆ› ۲. ئاژرانە؛ تەنگەتیلکە؛ پیشن؛ بە دۆخ یان چۆنیەتیەکی دوور لە دلۆڤانیەوە ‹رفتار خشن: ئاکاری ئاژرانە› ۳. سرت؛ درشت؛ گزم؛ گەرووز؛ گرس؛ قەرت؛ توند؛ سبر؛ درڕ؛ بێ‌نەرم و لووسی یان لەباوی. بەرانبەر: **نرم** ‹بافت خشن: هۆنەی گزم›.

**خشنود** / xošnûd/: *صفت. [ادبی]* خۆشحاڵ؛ وەرەک؛ رازی؛ قایل؛ قادێ؛ شادمان لە رووداوێ یان لە ئاکامی ئەو رووداوە ‹از شنیدن این خبر خشنود شد: لە بیستنی ئەم هەواڵە خۆشحاڵ بوو›: **خوشنود**

**خشنودی** / xošnûdî/: *اسم.* خۆشحاڵی؛ وەرەکی؛ قادێتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شاد بوون ‹موفقیت شما مایەی خشنودی همەی ماست: سەرکەوتنتان هۆی خۆشحاڵی هەموومانە›: **خوشنودی**

**خشوع** / 'xušû', xošû/: [عربی] *اسم. [ادبی]* خاکەساری؛ مل‌کەچی؛ گوێڕایەڵی.

**خشونت** / xušûnat, xošûnat، ـها/: [عربی] *اسم.* ۱. زوڤری؛ زبری؛ گزمی؛ سەختی؛ چۆنیەتی زرۆ و زۆق بوون ۲. توورەیی؛ سەختی؛ تون و تێژی؛ هەڵچوویی؛ قەلسی.

**خشونت‌آمیز** / -xušûnatāmîz, xošûnat/: [عربی/ فارسی] *صفت.* گرژانە؛ ئاژرانە؛ توند و تیژ؛ بە دۆخ یان بارێکی نادۆستانەوە، هاورێ لەگەڵ توورەیی ‹رفتار خشونت آمیز: ئاکاری گرژانە›.

**خشونت‌طلب** / -xušûnat.talab, xošûnat، ـها، ـان/: [عربی] *صفت.* گرژیخواز؛ گرژانەخواز؛ توند و

تیژی‌خواز؛ به خده یان وازی گرژانه‌وه.

**خشونت‌طلبی** / xušûnat.talabî, xošûnat- / ، ـها/: [عربی]/اسم. گرژیخوازی؛ توند و تیژی‌خوازی؛ ئۆگری به تووڕه‌یی و توند و تیژی.

**خصال** / xesāl/: [عربی] جمعِ ☜ **خِصلَت**

**خصائل** / xasā'el/: [عربی] ☜ **خصایل**

**خصائص** / xasā'es/: [عربی] ☜ **خصایص**

**خصایص** / xasāyes/: [عربی] جمعِ ☜ **خصیصه**: **خصائص**

**خصایل** / xasāyel/: [عربی] جمعِ ☜ **خِصلَت**: **خصائل**

**خصلت** / xeslat ، ـها؛ خِصال؛ خَصایل/: [عربی]/اسم. تایبه‌تمه‌ندی: ١. خوو؛ گرۆ؛ ئاکاری تایبه‌تی که‌سێ که بووه به خۆ و خده‌ی ‹بخشش خصلت خوبی است: به‌خشین، تایبه‌تمه‌ندیه‌کی چاکه› ٢. گه‌وشین؛ لێهاتوی یان دانسته‌ی شتێ ‹سوزاندن خصلت آتش است: سووتاندن تایبه‌تمه‌ندی ئاگره›.

**خصم** / xasm ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* دژمن؛ دوژمن؛ دژمه‌ن؛ نه‌یار؛ دژ ‹ای خصم حریف تو سپاه سحر است: ئه‌ی دژمن هه‌ڤبه‌ری تۆ له‌شکری به‌یانانه›.

**خصمانه**[1] / xasmāne/: [عربی/ فارسی] صفت. *[ادبی]* دوژمنانه؛ دژمنانه؛ دژانه؛ نه‌یارانه؛ وه‌کوو دوژمن ‹رابطه‌ی خصمانه: پێوه‌ندی دوژمنانه›.

**خصمانه**[2]: *قید. [ادبی]* نه‌یارانه؛ دوژمنانه؛ دژمنانه؛ دژاسا؛ دوژمن‌ئاسا ‹با او خصمانه رفتار کرد: نه‌یارانه له‌گه‌لیدا جوولاوه›.

**خصوصاً** / xusûsan, xosûsan/: [عربی] قید. به‌تایبه‌ت؛ به‌تایبه‌تی؛ نه‌وازا؛ نه‌خوازا ‹سلام همه، خصوصاً پدربزرگ را برسان: سلاوی هه‌مووان، به‌تایبه‌ت باوه‌گه‌وره بگه‌ینه›.

**خصوصی** / xusûsî, xosûsî/: [عربی] صفت. تایبه‌تی؛ ته‌یبه‌تی؛ تاویه‌تی؛ خۆمالی؛ گه‌وشت: ١. که‌سی؛ که‌سین؛ هی یه‌ک یان چه‌ند که‌سی دیار ‹زندگی خصوصی: ژیانی تایبه‌تی› ٢. خۆیی؛ خۆخۆیی؛ خۆخوێ؛ هۆمایی؛ خۆمالی؛ بۆ که‌لک لێ وه‌رگرتنی که‌سێک و هاوڕێیانی ‹اتاق خصوصی؛ درس خصوصی: ژووری تایبه‌تی؛ وانه‌ی تایبه‌تی› ٣. نا ده‌وله‌تی ‹بیمارستان خصوصی؛ مدرسه‌ی خصوصی: نه‌خۆشخانه‌ی تایبه‌تی؛ قوتابخانه‌ی تایبه‌تی› ٤. ناوخۆیی؛ ناڕه‌سمی؛ نافه‌رمی؛ به شێوه‌یێکی نه‌ک هه‌مووانی و به‌رچاو ‹گفتگوی خصوصی: وت‌وویژی ناوخویی›.

**خصوصیات** / xusûsîyyāt, xosûsîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **خصوصیّت**

**خصوصیت** / xusûsîyyat, xosûsîyyat/: [عربی] /اسم. تایبه‌تمه‌ندی؛ گه‌وشین: ١. /ـها؛ خصوصیات/ دانسته ‹یکی از خصوصیات او علاقه‌اش به مطالعه‌ی کتاب بود: یه‌ک له تایبه‌تمه‌ندیه‌کانی هۆگری به کتێب خوێندنه‌وه بوو› ٢. دۆستایه‌تی؛ دۆستی؛ که‌ین و به‌ین؛ پێوه‌ندی تایبه‌تی ‹ما با هم هیچ خصوصیتی نداریم: ئێمه هیچ دوستایه‌تیه‌کمان پێکه‌وه نیه›.

**خصوصی‌سازی** / xusûsîsāzî, xosûsî- ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. تایبه‌تی‌کاری؛ کار یان ڕه‌وتی گۆڕانی خاوه‌نێتی ده‌وله‌تی به خاوه‌نیه‌تی گه‌وشتی.

**خصومت** / xusûmat, xosûmat ، ـها/: [عربی] اسم. *[ادبی]* دوژمنایه‌تی؛ دژمنیه‌تی؛ دوژمنی؛ دژمنی؛ دژمه‌نکاری؛ نه‌یاری ‹پس از مدتی حس همکاری و اعتماد تبدیل به خصومت شد: پاش ماوه‌یه‌ک هه‌ستی هاوکاری و هاودلی بوو به دوژمنایه‌تی›.

**خصی** / xasey/: [عربی] صفت. *[ادبی]* خه‌سیاگ؛ خه‌ساو؛ گون‌بڕاو؛ گون ده‌رهاتگ.

**خصیتین** / xosyateyn/: [عربی]/اسم. گونان؛ دوو هێلکه‌گون؛ هێلکه‌گونێ؛ هه‌ر دوو باتوو.

**خصیصه** / xasîse ، ـها؛ خصایص/: [عربی]/اسم. دانسته؛ تایبه‌تمه‌ندی؛ گه‌وشین ‹خصیصه‌ی

فداکاری و همبستگی در آنها وجود داشت: دانستەی فیداکاری و یەکگری لە نێویاندا هەبوو›.

**خضاب** / xazāb، ـها/: [عربی]/اسم. [قدیمی]/ خەزاو؛ ڕەنگاو؛ ماکی ڕەنگی (وەک خەنە و توێکلی گوێز) یان تێکەڵاوی ئەمانە کە پێشتر بۆ ڕەنگ کردنی قژ بە کار دەچوو.

▣ **خضاب کردن:** ڕەنگاندن؛ گۆناندن؛ ڕەنگ کردن ‹آن دلاوران جامه بە خون خویش خضاب می‌کردند: ئەو جوامێرانە بە خوێنی خۆیان بەرگەکانیان دەڕەنگاند›.

**خضرا** / xazrā/: [عربی] صفت. [ادبی]/ ١. سەوز؛ شین؛ کەسک ٢. سەر سەوز؛ شیناوەرد ‹جزیرەی خضرا: دوورگەی سەرسەوز›.

**خضوع** / xozû', xuzû'/: [عربی]/اسم. [ادبی]/ خاکەساری؛ خاکەڕایی؛ بێ‌فیزی؛ بێ‌دەماری.

**خط** / xat(t)، ـها؛ خطوط/: [عربی]/اسم. ١. هێڵ؛ کڕ؛ کێڕ؛ زاخ؛ کێڵە؛ نیشانەیەکی باریک و کێشراو کە لە شوێن دانانی شتێ لە سەر ڕوویەکی لووسدا بەدی دێ ‹خط اتو؛ خط ترمز: هێڵی دەق؛ هێڵی تورمز› ٢. خەت؛ نیگار؛ ئەلفوبێ؛ شیک؛ تێکڕای ئەو نیشانانە کە وشە و ڕستەی زمانێکیان پێ دەنووسرێ ‹خط کردی؛ خط لاتین: خەتی کوردی؛ خەتی لاتین› ٣. [گفتاری] دەسنووس؛ قاقەز؛ خەت؛ نووسراوە؛ بەڵگە؛ نامە ‹برو از رییس یک خط بیاور: بچۆ لای سەرۆکەوە، دەسنووسێ بێنە› ٤. خەت؛ شێوەی نووسینی ئەلف و بێی زمانێ ‹خط نستعلیق؛ خط کوفی؛ خط خوش: خەتی نەستەعلیق؛ خەتی کووفی؛ خەتی جوان› ٥. [گفتاری] خەت؛ خۆشنووسی؛ جوان‌نووسی؛ گوندەنووسی ‹معلم خط: مامۆستای جوان‌نووسی› ٦. [هندسه] [الف) هێڵ؛ شوێنێ کە لە درێژەدانی خاڵێکەوە دروست دەبێ و تەنیا یەک لایەن (درێژایی) هەیە ب) هێڵ؛ شوێنی پێکدادانی دوو پاڵوو ٧. ڕێگە؛ هێڵ؛ ڕێبازی چوون لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێ‌تر ‹خط سنندج ــ کرمانشاه: ڕێگەی سنە ـ کرماشان› ٨. هێڵ؛ دەزگایەکی یەکپارچە کە دەبێتە هۆی ڕاگواستنەوەی شتێک ‹خط آهن؛ خط تلفن؛ خط هوایی: هێڵی ئاسن؛ هێڵی تەلەفوون؛ هێڵی ئاسمانی› ٩. ڕێباز؛ دۆز؛ کاربەند؛ گاڤین؛ مەرام؛ مەرەم؛ گرەوین؛ ئۆگرەتی؛ شێوازی فکری یان ئاکاری ‹خط اسلام؛ خط خوشگذرانی: ڕێبازی ئیسلام؛ ڕێبازی ڕابواردن› ١٠. دێڕ؛ دێغ؛ دێخ؛ گێڕ؛ خێز؛ خەت ‹یک خط بخوان: دێڕێ بخوێنەوە› ١١. دێڕ؛ بەیت ‹دو خط شعر خواندم: دوو دێڕ شیعرم خوێندەوە› ١٢. هێڵ؛ سنوور؛ کەوشەن ‹خط افق؛ خط ساحل: هێڵی ئاسۆ؛ سنووری بەستێن› ١٣. هێڵ؛ خولگە و هێڵەکانی زەوی ‹خط استوا: هێڵی ئوستوا› ١٤. هێڵ؛ هەر کام لە تایبەتمەندیەکانی دیار، باریک و کێشراوەی ئەندامەکانی لەش یان وێنە ‹خط ابرو: هێڵی برۆ› ١٥. خەت؛ دیوێ لە سکە وا زۆرتر نرخی بە ژمارە لە بانیەوە نووسراوە؛ ئەو دیوی شێر.

▣ **خط آهن:** هێڵی ئاسن.

**خط ابرو:** ١. هێڵی برۆ؛ بەشێ لە ژووری چاو کە مووی برۆی لێ ڕواوە ٢. شێوەی برۆ؛ درێژایی برۆ ٣. نیشانەیەک بەم شێوەیە «{ }»کە وشە یان ڕستەیەکی تێ‌دەخەن.

**خط اتو:** خەتی وتوو؛ هێڵی دەق؛ شوێنەوار یان دەقێ کە بە هۆی کێشانی ئوتوو بە سەر پارچەدا بەدی دێ.

**خط اتوبوس:** هێڵی باس؛ کۆمەڵەیەک بریەتی لە چەند ئوتووبووس کە لە شوێنێکی تایبەتدا هات‌وچۆ دەکەن. هەروەها: **خط مینی‌بوس؛ خط کشتیرانی؛ خط هوایی**

**خط استوا:** هێڵی ئوستوا؛ هێڵی ناوەڕاست؛ هێڵی کەمەرە؛ جەغزێکی گریمانەیی بە مەودای بەرامبەر لە جەمسەری باکوور و باشووری گۆی زەویەوە.

**خط افق:** هێڵی ئاسۆ؛ هێڵێکی گریمانەیی لە بەرامبەری کەسێکەوە کە بۆ دوور دەڕوانێ و لە چاوی ئەودا ئاسمانی بان سەری لە زەوی جیا دەکاتەوە.

**خط انتقال نیرو:** هێڵی گواستنەوەی بەرق؛ هێڵی گۆزانەوەی کارەبا.

**خط برنج:** نوسینی سریی؛ کەرەسەیێک بۆ نەخشاندنی خەت لە پیتچنی دەستیدا.

**خط بْرِیل** ☜ **بْرِیل**

**خط بُطلان:** خەتێ کە بۆ بەتاڵ کردنەوە یان بێنرخ کردنی نووسراوەیەک بە سەریدا دەکێشن.

**خط تاریخ:** هێڵی مێژوو؛ خەتێکی خەیاڵی داندراوە کە بە پێی پێکهاتەی نێونەتەوەیی، سەرەتای ڕۆژ لە لای ڕۆژاوای ئەو خەتەوە دەست پێ دەکا. کەوابوو ڕۆژژمێر لە لای ڕۆژاوای ئەو خەتەوە ڕۆژێک پێشتر لە لای ڕۆژهەڵاتیەتی.

**خط ترمز:** هێڵی تورمز؛ ئاسەوارێ کە لە تورمزکردنی بە توندی ماشێن لە سەر جادە و ڕێوە بەدی دێ.

**خط تصویری:** خەتی وێنەیی؛ خەتێ کە هەر نیشانەیەک تێیدا نوێنەری واتایەکە.

**خط تلفن:** هێڵی تەلەفوون؛ کۆمەڵە ئامرازێ کە دەبێتە هۆی کارکردنی تەلەفوونێک. هەروەها: **خط تلگراف**

**خط تولید:** هێڵی بەرهەمکاری؛ تێکڕای کەرەستە و ڕەوتی بەدیهێنانی بەرهەمێک.

**خط تیره:** هێڵی ڕەش؛ هێڵێکی ئاسۆیی بچووک کە لە نێوان دوو ژمارەدا یان بۆ جوێ کردنەوەی بەشێک لە ڕستە بە کار دێ. تیره[1]**ـ٢**

**خط چینی:** خەتی چینی؛ خەتێ کە زمانەکانی وڵاتی چینی پێ دەنووسرێت. هەروەها: **خط کردی؛ خط فارسی؛ خط عربی**

**خط حامل:** *[موسیقی]* خەتی مووسیقا؛ پێنج خەتی هاوشان کە لە نوتنووسیدا بە کار دێ.

**خط خرچنگ قورباغە:** *[مجازی]* خەتی قۆلانچەیی؛ نووسینی لار و خوار و ناشیرین.

**خط خوانا:** خەتی جوان؛ نووسراوەیێ کە بە ئاسانی بخوێنرێتەوە. هەروەها: **خط خوش**

**خط درشت:** خەتی درشت: ١. خەتێ کە بە قەڵەمی نووک پان (زۆرتر قەڵەم نەی) دەنووسرێت ٢. نووسراوەیەک کە پیتەکانی گەورەن.

**خط رأس** ☜ **خطُّ‌الرَّأس**

**خط راست:** هێڵی ڕاست؛ هێڵی ڕێک؛ هێڵێ کە گشت پیتەکانی لە یەک ڕاستادان.

**خط ریز:** خەتی ورد؛ خەتی ڕیز: ١. خەتێ کە بە قەڵەمێکی دەم باریک و ورد نووسرابێ ٢. نووسراوەیەک کە پیتەکانی وردن.

**خط زنجیر:** ڕیز؛ گەڵواز؛ گەڵوازە؛ زنجیرەهێڵ: ١. ڕیزێ لە کەسان کە دەستی یەکیان گرتووە و زنجیرێکیان پێک هێناوە ٢. ڕێچکە؛ ڕچە؛ خێزەرە؛ کەڕەسوولە؛ ڕەوێلە؛ قەتارە؛ کوور؛ ڕیزێ لە گیانەوەرانی شوێن‌بەشوێن لە ڕۆیشتندا.

**خط ساحل:** هێڵی بەستێن؛ سنووری ئاو و وشکانی.

**خط سیر:** ڕێ؛ ڕێگا؛ ڕێبازگە.

**خط سیریلی:** خەتی سیریلی؛ خەتێ کە زمانی ڕووسی و برێ زمانانیرۆژهەڵاتی ئورووپای پێی دەنووسن و شێوەکەشی لە سەرەتاوە لە خەتی یۆنانی وەرگیراوە: **الفبای سیریلی**

**خط شَجَری:** *[قدیمی]* خەتی شەجەری؛ جۆرە خەتێکی باو لە مێژووی ئێراندا کە پیتەکانی ئەلفوبێی بە شێوەی خەتێکی ئەستوونی چکۆلە بە یەک یان چەن لقی هەڵازناوەوە دەنووسرا.

**خط شکسته:** ١. *[هندسه]* خەتی شکاو؛ هێڵی

شکاوه ۲. ☜ شکسته[1]

**خط فاصله:** هێڵی مەودا؛ خەتی دوورینگ؛ هێڵێکی بچووک لە نێوان دووبەشی وشەیەکی تێکەڵدا (وەکوو: فارسی- ئینگلیسی؛ ڕادیۆ-تەلەڤیزیۆن).

**خط قرمز:** هێڵی سوور: ۱. *[مجازی]* سنووری مەترسی؛ کەوشەنێ کە لێ‌ترازانی جێی مەترسیە ۲. خەتی سوور؛ نیشانەی بەتاڵ‌کردنەوە یان بێ‌برەو کردنی شتێ (وەک نووسراوەیێک).

**خط قعر** ☜ **خطُّ‌القعر**

**خط کرسی:** خەتی کاغەز؛ هێڵێکی ئاسۆیی کە پیتەکان لە سەر و خواری دادەنرێن.

**خط کسری:** خەتی شکاوی؛ هێڵێ کە دوو ژمارە لە سەر و ژێریەوە دەنووسن، بە واتەی دابەشینی سەروو بە ژێریندا.

**خط لاتین:** خەتی لاتین؛ خەتێ کە لە ئیتالیادا گوورا و ئێستاکە خەتی باوی ولاتانی ئورووپای ڕۆژاوا، ئەمریکا، ئوسترالیاو برێ ولاتانی ئاسیا و ئافریقایە: **الفبای لاتین**

**خط لوله:** هێڵی لوولە؛ کۆمایێ لوولە و دەم و دەزگای پێکەوە بەستراو بۆ ناردنی بەردەوامی تراو یان گاز لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر.

**خط مشی:** ڕێبازگە؛ شێوەی ئاکار یان کردار ‹خط مشی سیاسی: ڕێبازگەی ڕامیاری›.

**خط مماس:** هێڵی لێ‌کەوتە؛ هێڵی بەرکەوتە؛ خەتێکی ڕاست کە تەنیا لە نوقتەیێکدا لەگەڵ خەتێکی چەماوەدا یەکی گرتووە.

**خط منحنی:** خەتی چەماوە؛ هێڵی چەوت؛ هێڵی کۆم؛ هێڵی کوور؛ هێڵێ کە نەڕاست و نە شکاوە بێ.

**خط میخی:** خەتی بزماری؛ خەتێ کە ۴۰۰۰ سالی پێش لە بەین‌چۆمان گوورا، ئەلفوبێتکەی ئەم شێوە نووسینە لە بزماری چێوین دەچێ.

**خط هیروگلیف:** خەتی هیرۆگلیف: ۱. خەتێکی وێنەیی لە میسری کۆندا ۲. *[کنایی]* هەر جۆرە خەتێکی وێنەیی.

▣ **خط افتادن:** ڕووشیان؛ ڕووشان؛ ڕووش تێ کەوتن؛ ڕووکیان؛ ڕیش‌کەوتەینە؛ هێڵ یان کێڕ کەوتنە سەر ڕووبەری شتێ ‹دوسه جا روی بدنەی ماشین خط افتاده بود: لە دووسێ شوێنەوە ماشینەکە ڕووش‌بوو›. هەروەها: **خط انداختن**

**خط دادن:** *[کنایه]* ڕێگا نانە بەرپا؛ ڕێنوێنی کردن؛ مۆچیاری کەردەی؛ بەرنامە یان ئامۆژەیەکی فیکری یان کردەوەیی بە کەسێ یان دەستەیەک دان ‹رادیوهای بیگانە بە ضدانقلابها خط می‌دادند: ڕادیۆ بێگانەکان ڕێگایان بەرپای دژانی شۆڕش دەنا›. هەروەها: **خط گرفتن**

**خط روی خط افتادن:** تێکەڵ بوونی هێڵگەل؛ هێڵ بە هێڵ بوون؛ پەیدا بوونی تێکەلاوی لە چەند تەلەفووندا.

**خط زدن:** خەت دان؛ کووزدان؛ بەتاڵ کردنەوەی نووسراوەیێک بە کێشانی خەت بە سەریدا ‹من نمی‌آیم، اسمم را خط بزن: من نایەم، نێوم خەت بدە›.

**خط کسی را خواندن:** *[مجازی]* گوێ بۆ کەسێ گرتن؛ بەقەوڵ کەسێ‌کردن؛ گۆش دەپنەی؛ گرنگی دان بە فەرمان و ڕاسپاردەی کەسێک ‹در آنجا کسی خط مرا نمی‌خوانَد: دەوێدا کەس گوێ بو من ناگرێ›.

**خط کشیدن:** خەت‌کێشان: ۱. هێڵ‌کێشان؛ هێڵ نەخش‌کردن ‹زیر صفتها و قیدها خط بکش: ژێر ئاوەڵناو و ئاوەڵکارەکان خەت بکێشە› ۲. خەت دان ‹روی این جمله خط بکش: خەتێ بکێشە مل ئەم ڕستەدا›.

**خط نوشتن:** خەت نووسین؛ تەمرینی جوان‌نووسی کردن.

**به خط کردن:** ڕیزکردن؛ لـه هێـڵێکدا دانـان؛ هاندان بۆ بەڕیز وەستان ‹بچەها را به خط کرد: منداڵەکانی ڕیز کرد›.

**تو(ی)// در خط چیزی بـودن:** *[گفتاری]* واز لـه شتێ بوون؛ خێ دان یان ئۆگرەتی پەیا کردن بە شتێک‹آزادتو خط مطالعه بود: ئـازاد وازی لـه خویندنەوە بوو›.

**خطا** [1] / xatā ، ـها/: [عربی]/*اسم.* هەڵـە؛ چـەوتی؛ قۆڕن؛ هەینە؛ سووچ؛ تاوان؛ کارێ کـە دروسـت جـێبـەجێ نـەکراوە، یـان لەگـەڵ قـانوون یـا ڕێوشوێنی کۆمەڵگادا یەک ناگرنـەوە ‹خطـای او این بود که خود را کوچک می‌شمرد: هەڵەی ئـەوە بـوو خۆی بە کەم دەزانی›.

▣ **خطا رفتن:** بە هەڵەدا چوون؛ نەپێکان؛ بە لای نادروستدا چوون ‹تیرش به خطا رفت: تیرەکـەی به هەڵەدا چوو›.

**خطا کردن:** هەڵەکردن: ۱. دروست جێبەجێ نەکردنی کارێ ‹در شناختن دوستانش خطا کـرده بود: لـە ناسـینی دۆسـتەکانیدا هەڵـەی کردبـوو› ۲. کارێ خراو یان نابـەجێ کـردن ‹اگـر خطـا کـردەام مـرا ببخـشید: ئەگـەر هەڵـەم کـردووە بمبەخشن›.

**خطا** [2]: *صفت.* هەڵـە؛ نادروسـت؛ چـەوت؛ قـۆڕن. بەرانبەر: **صواب** ‹کار خطا؛ راه خطا: کاری هەڵە؛ ڕێی هەڵە›.

**خطاب** / xetāb, xatāb/: [عربی]/*اسم.* ۱. ڕووی دەم؛ ڕووی قسە؛ ئاخاوتن لـە هەمبـەر یەکـەوە ۲. سەرکۆنە؛ سەرکۆ.

▣ **خطاب کردن:** ناو لێبردن؛ ناو بردن؛ ناو نـان ‹در نامه‌ای او را احمق خطاب کرده بود: لە نامەیەکدا بە گەوج ناوی لی بردبوو›.

**خطابخـش** / xatābaxš/: [عربـی/ فارسـی] *صفت.* *[ادبی]* خەتابەخش؛ بە خوو یان وازی بەخـشینی گونای دیترانەوە.

**خطابه** / xatābe ، ـها/: [عربی]/*اسـم.* وتـار؛ گوتـار؛ وتە؛ ئەوەی لە هەمبەر کۆمەڵـێکەوە دەگـوترێ، بەتایبەت وتاری ڕەسمی کـە لـە پێـشدا ئامـادە کراوە.

**خطاپوش** / xatāpûš ، ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* *[ادبی]* هەڵەپۆش؛ بە تایبەتمەندی یان توانـستی چـاو پۆشـین لـە هەڵـەی دیتـران. هـەروەها: **خطاپوشی**

**خطاط** / xattāt ، ـها/: [عربی]/*اسم.* خـەتخـۆش؛ خۆشنووس؛ جواننووس؛ گوندەنووس.

**خطاطی** / xattātî ، ـها/: [عربـی]/*اسم.* خـەتاتی؛ جواننووسی؛ خۆشنووسی؛ گوندەنووسی.

**خطـاکـار** / xatākār ، ـهـا؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی] *صفت.* شـەپنی؛ تاوانکـار؛ خـەتاکار؛ هەڵـەکار؛ خاوەنی کردەوەی هەڵە. هەروەها: **خطاکاری**

**خـطالـرأس** / xattorra's ، ـهـا/: [عربـی]/*اسـم.* ۱. هێڵی سەروو؛ هێڵێ کە لـە بـانترین شـوێنی بەرزاییێکەوە (وەک کێو، یـاڵ، گردۆڵکە و وەکـوو ئەوانە) تێدەپەڕێ ۲. ئاوڕێژە؛ ئاوڕێژگـە؛ کەنـد و لەندی زەمینی نێوان دوو یـا چەنـد ڕووبـار کـە دەبێتە هۆی دابەشی ئاوی باران ✻ **خطّ رأس**

**خطالقعر** / xattolqa'r ، ـها/: [عربی]/*اسم.* بنەهێڵ؛ هێڵێ کە لـە قووڵـترین شـوێنی ڕووبـارێ یـان دۆڵێکەوە ڕادەبرێ: **خطّ قعر**

**خـطالمرکـزین** / xattolmarkazeyn/: [عربـی] *اسم.* هێڵێ کە ناوەنـدی دوو بیچمـی هینەسـی (وەک جەغز و چوارگۆشە) پێکەوە پەیوەند دەدا.

**خطایا** / xatāyā/: [عربی] جمعِ ☜ **خَطیئه**

**خطبا** / xotabā/: [عربی] جمعِ ☜ **خَطیب**

**خطبه** / xotbe ، ـها/: [عربی]/*اسم.* وتار: ۱. خوتبە؛ خودبـە؛ وتـاری مـەلا پـێش نـوێژ ۲. *[قـدیمی]* وتەبێژی.

▣ **خطبەی عقد:** وتاری مارەبڕان؛ دۆعایێـک کـە لە مارەبڕیندا، مارەبڕ دەیخوێنێ.

**خط ـخطی** / xatxatî/: [عربی] *صفت.* ڕێ ـڕێ؛ خەت ـخەتی؛ بە نەخشێکی بەشێوەی هێـڵگەلی

یەک لە دوای یەک و لە سەریەک.

**خطـدار** / xatdār ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* هێڵدار؛ خەتدار ‹کاغذ خطدار: قاقەزی هێلدار›.

**خطر** / xatar ، ـها؛ ـات/: [عربی] *صفت.* مەترسـی؛ بـڤ؛ بـڤە؛ ڤـڤ؛ خـەبار؛ بزدینـۆک؛ ئەگـەری هەبوونی زیان.

▣ خطر از سر کسی گذشتن ☜ **از خطر گذشتن**

خطر داشتن: مەترسـی هـەبوون؛ مەترسـیدار بوون؛ پڕمەترسی بوون؛ بڤە بوون ‹نگاه کـردن به نور خورشید برای چشم خطر دارد: ڕوانین بۆ خـۆر بۆ چاو مەترسی هەیە›.

خطر کردن: خۆ خستنە مەترسیەوە؛ ئەگەری زیان قەبووڵ‌کردن ‹آزاد حاضر شد خطر کند و بە آب بزند: ئازاد ئامادە بوو خۆی بخاتە مەترسیەوە و بالە ئاو›.

از خطر گذشتن: لـە مەترسـی پەڕینـەوە؛ لـە مەترسی ڕزگار بوون؛ دەرچوون لـە ئەگـەری بەلا یان زیان ‹با تمام شدن توفان، از خطر گذشتیم و بە آرامی از کوە پایین آمدیم: کە باهۆزەکە دامرکا، لە مەترسی ڕزگار بووین و وردە‌ـ وردە لە چیاکەوە دابەزاین›: **خطر از سر کسی گذشتن**

بـە خطـر افتـادن: کەوتنـە مەترسـیەوە؛ بـەر هەتەرکەوتن؛ کەوتنـە بـەر ئەگـەری زیـان و وەزەنگەوە ‹بر اثر سهل‌انگاری و نگرفتن اطلاعـات هواشناسـی، جـان همـە بـە خطـر افتـاد: لـە بـەر کەمتەرخەمی و بێ‌ئاگایی لە چۆنـاوچۆنی کـەش، گیانی هەمووان کەوتـە مەترسـیەوە›: **بـە خطـر انداختن**

**خطـر آفـرین** / xatarāfarîn ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* مەترسی‌سـاز؛ هـۆی پەیـدا بـوونی مەترسی.

**خطرناک** / xatarnāk/: [عربی/ فارسی] *صفت.* جێ مەترسی؛ مەترسیدار؛ زەرندە؛ بڤە؛ نەتەکن ‹شـنا کردن در دریای طوفانی خطرناک است: مەلـەکردن لـە دەریای واهووردا جی مەترسیە›.

**خط شناسـی** / xatšenāsî/: [عربـی/ فارسـی] *اسـم.* خەتناسـی؛ ناسـینی شـێوەی نووسـین؛ کـاری ناسینی خەت: *الف)* لـەوەی کـە پێوەنـدی بـە نووسەرەوە هـەبێ یـا نـە *ب)* لـە بـاری جـۆری ئەلفوبێوە یان ئەوەی کە خەتەکە هی چ زەمان و چ زمانێکە. هەروەها: **خطشناس**

**خط‌کـش** / xatkeš ، ـها/: [عربـی/ فارسـی] *اسـم.* هێڵینگ؛ زاغور؛ ڕاستە؛ خـەتکێش؛ خەتکـەش؛ کرکەش؛ ئامرازێکی تـەخت و باریـک لـە چێـو، لاستیک یان کانزا، بـۆکێـشانی خـەتی ڕێـک و هەروەها پێوانی درێژی خەت.

▣ خط‌کش تی: خەتکەشـی تی؛ هێـڵینگێ کـە سـەرەکەی بـە خەتکێـشێکی چکۆلـەتر لـە خۆیـەوە لکـاوە و بـەم بیچمەیـە «T»، بـۆ کێشانی خەتگەلی لەیەک ڕاستەدا.

خـط‌کـش محاسـبە: خەتکەشـی ژمێریـاری؛ خەتکەشی لە یەکدانەوە؛ جۆرێک خەتکێـشی زانیاریە بۆ پێوان و بەرامبەر کردنەوە.

**خط‌کشی** / xatkešî ، ـها/: [عربـی/ فارسـی] *اسـم.* ۱. خەتکێشی؛ کار و ڕەوتی هێڵ‌کێـشان بەتایبـەت کێشانی هێڵی هاوشان ‹این صفحە را خط‌کشی کن: ئەم لاپەڕە خەتکێشی بکە› ۲. هێڵکاری؛ شتێ کە لە بانیەوە خەتکێشی کرابێ ‹از روی خط‌کشی عبور کنید: لە بان هێلکاریەکانەوە هاتوچۆ بکەن›.

**خطمی** / xatmî/: [عربی] ☜ **ختمی**

**خط و خال** / xat(t)-o-xāl/: [عربی] *اسم.* خاڵ و مێڵ؛ نەخش، ڕەنگ و تایبەتمەندیگەلی ڕواڵەتی گیاندارێک ‹مار خوش خط و خال: ماری خاڵ و میل جوان›.

**خطور** / xutûr, xotûr/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* دزە؛ کار یان ڕەوتی بە بیردا هاتن؛ کەوتنەوە بیر؛ بـە بیر گەیشتن؛ پێدا بواردن؛ ئامایوە ویر.

**خط و ربط** / xat(t)-o-rabt/: [عربی] *اسم.* دەست و قەڵەم؛ جوان نووسـی و نووسـەری ‹خـط‌وربط خوبی داشت: دەست‌وقەڵەمێکی باشی هەبوو›.

**خطوط** / xutût, xotût/: [عربی] جمعِ ☜ **خط**

**خـطونـشان** / xat(t)-o-nešān/: [عربـی/ فارسـی] /اسم. نیشانەیەک بە چەشنی × یان + کە جـار و بار لە هەڕەشەوگوڕەشەدا بۆ پێداگری لـە سـەر قسەی خۆ، بە ئەنگووسی نیشانە دەیکێشن.

▣ **خـط و نـشان کـشیدن بـرای کـسی**:*[کنایی]* هـەڕەشـە و گوڕەشـە کـردن لـە کەسـێک؛ کەسێک ترساندن.

**خطه** / xette/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ناوچە؛ مەڵبەند؛ ناوان؛ کاڤار ‹خطەی سرسبز بانه: ناوچـەی تـەوزاوی بانە›.

**خطـی** / xattî/: [عربـی] صـفت. ۱. خــەتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە هێڵ ‹تصویر خطی: وێنەی خـەتی› ۲. دەسـتنووس؛ نووسـراو بـە دەسـت ‹کتاب خطی: کتێبی دەستنووس›.

**خطیئـه** / xatî'e، خطایـا/: [عربـی]/اسم. *[نامتـداول]* هەڵـە؛ چـەوتی؛ خــەتا؛ کـردار یـان ئاکـاری نادروست.

**خطیـب** / xatîb، ـهـا؛ ـان؛ خُطبا/: [عربـی]/اسم. وتەوان؛ وتاربێژ؛ وتاروان: ۱. دەمپاراو؛ وتـەپاراو؛ کەسێ کە لە وتاربێژیـدا لێهـاتوو بـێ ‹او خطیـب زبردستی بود و می‌توانست شنوندگان را به هیجـان آورد، بخنداند یا بگریانـد: وتەوانێکی لێهاتوو بـوو، دەیتـوانی بیسەران بهـەژێنێ، بێنێتـە پێکـەنین یـان گریـان› ۲. کەسێ کە خوتبە دەخوێنـێ یـان لـە نوێژی هەینیدا قسە دەکا.

**خطیر** / xatîr/: [عربی] صفت. *[ادبـی]* ۱. گرینـگ؛ گرنـگ؛ گـەم؛ مـەزن؛ گـەورە؛ لـە بـەرچاو؛ بـە چەندیەتی یان چۆنیەتیەکی بـەرچاوەوە ‹کمـک رسانی به سیل‌زدگان اقدام خطیری بـود: یارمـەتی دانی بەر لافاو کەوتوان کارێکی گرینـگ بـوو› ۲. گـران؛ پڕمەترسـی؛ دژوار؛ حەسـتەم ‹آقایـان مأموریـت خطیری بر عهده‌شان است: برادەران کارێکی گرانیـان لە ئەستۆیە›.

**خفـا** / xafā/: [عربـی]/اسـم. نهـێنی؛ پەنامـەکی؛ داپۆشراوی؛ شاراوەیی.

▣ **در خفا**: بە پەنامەکی؛ بـە نهـێنی؛ لە ژێرەوە؛ چێرەنە؛ بـە دزی؛ بـە دزیـەوە؛ بـە دزیکەو ‹در خفا مبلغی بـه او داد تـا چیـزی نگویـد؛ مدتی در خفا زندگی می‌کرد: بە نهێنی پارەیەکی پێ دا دەنگ نەکا؛ ماوەیەک پەنامەکی دەژیا›.

**خفــاش** / xoffāš، ـهـا؛ ـان/: [عربـی]/اسـم. پرچـــەمێک؛ چەکچـــەکی؛ چەکچەکیلـــە؛ شەمـشەمەکوێرە؛ شەمـشەمە؛ مەشموولـەکۆرە؛ شەوکۆرە؛ شەڤڕەڤک؛ ڤەڤرەڤیـک؛ شەڤڕەڤـین؛ شەڤڕەڤینک؛ شەڤکۆر؛ قەڕناقووچە؛ قەڕناقووچ؛ باڵندەیەکی گوهانداری شەوفڕ، زسـتان خـەو و بەچکەزێیە، بە گەل بـە ڕووی لـقوپـۆی داران، یان لە گـازی زنـاران یـا دەکـونی ئەشـکەوتاندا دەژین، بڕێکیان میوەخۆر و هەنـدێکیان مێـروو خۆرن.

▣ **خفـاش خـون‌آشـام**: شەمـشەمە کـوێرەی خوێنمژ؛ جۆرە شەڤکۆرێکی تایبەتی دەڤـەری گەرمیانە بە گازگرتن خوێنی گیانـەوەرانی تـر هەڵدەمژێ.

**خفت** / xeffat، ـهـا/: [عربـی]/اسم. ۱. پەسـتی؛ سووکی؛ سەرشۆڕی ۲. زەبوونی؛ زەلیلی.

▣ **خفت دادن**: سـووک کـردن؛ پەسـت کـردن ‹دایم او را خفت می‌داد: هەمیشە سووکی دەکرد›.

**خفت کشیدن**: لارەملی‌کێشان؛ مل داخسـتن؛ مــل خـــوارکردن؛ مــل کـــەچی کێـــشان؛ ڕووزەردی‌کێشان؛ سەرە وسەیرە؛ لارە ملـی و زەبوونی قەبووڵکردن ‹چقدر به خـاطر تـو خفـت کشیدم و به این و آن التماس کردم: چەندە بە بۆنەی تۆوە لارەملیم کیشا و لە ئەم و ئەو پاڕامەوە›.

**خفت** / xeft، ـها/:/اسم. ۱. جۆرێ گرێیە کە بـە کێشانی دوو سەری بەنەکە سـفت‌تـر دەبێتـەوە ۲. *[ریاضی]* درێژایی.

▣ **خفــت انــداختن**: ۱. گــرێ دان؛ لکــە دەی ۲. *[مجازی]* تەنگ لێ‌هەڵچنین؛ زۆر بۆ هێنان.

**خفت کسی را کشیدن:** *[مجازی]* زیپ بۆ کەسێک هاوردن؛ ڕیپ بۆ کەسێ هێنان؛ زۆر بۆ کەسێک هێنان ‹برو خفت پدرشوهرت را بکش بیاید: بچۆ زیپ بینە بۆ خەزوورەت با بێت›.

**خفتان** / xeftān ، ـها/: *اسم.* ژێرزرێ؛ خەفتان؛ خفتان؛ جلی لە پەمۆ یا ئاورێشم کە لە کۆندا بۆ شەڕ لە بن زرێوە دەبەر دەکرا.

**خفتگی** / xoftegî/ ☜ **نَهُفتگی-٢**

**خفتن** / xoftan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* // **خفتی:** خەوتی؛ **می‌خسبی:** دەخەوی؛ **بخسب:** بخەوە// خەوتن؛ خەفتن؛ نووستن؛ وتەی؛ نقستن؛ هەفتن؛ ڕازان؛ خەفان.

■ صفت مفعولی: **خفته** (خەوتوو)/ مصدر منفی: **نخفتن** (نەخەوتن)

**خفته** / xofte ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* خەوتوو؛ خەفتوو؛ خەفتگ؛ نووستوو؛ هەفتوو؛ نقستی؛ خەو لێ‌کەوتوو ‹خفته را خفته کی کند بیدار؟: خەوتوو چۆن خەوتوو وە خەبەر دێنێ؟›.

**خفچه** / xafče ، ـها/: *اسم.* جۆرێ گۆییژ؛ بلچ.

**خفقان** / xafaqān, xafeqān/: [عربی] *اسم.* ١. تاساوی؛ تاسیاگی؛ هەناسەتەنگی؛ پشووسواری؛ بەرهەنگی؛ هەناسەبڕی؛ دۆخێ کە بە هۆی پەیدا بوونی گرفتێک لە کاری هەناسەکێشاندا بەدی دێ ٢. *[سیاست]* دەمکوتی؛ دەموەسی؛ ئەنگوستلەچاوی؛ تەپەسەری؛ دۆخی نەبوونی ئازادی سیاسی و فەرهەنگی لە کۆمەڵگادا ٣. *[مجازی]* قەراقوپ؛ قوڕوقوپ؛ قڕقەپ؛ سمڕی؛ بێ‌دەنگی؛ بێ‌هەست و خوستی لە بەر زەبر و زۆر: **خفه‌خون** *[گفتاری]*

▣ **خفقان گرفتن:** *[تعریض]* لاڵ بوون؛ دەم بەستن؛ بێ دەنگ و مت بوون و هیچ نەگوتن ‹چرا جواب نمی‌دهی؟ خفقان گرفتی؟: بۆ وەرام نادەیتەوە؟ لاڵ بوویی؟›.

**خفقان‌آور** / xafaqānāvar, xafeqān-/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بەرهەنگێن؛ هەناسەبڕ؛ بەدیهێنەری هەناسەتەنگی.

**خفگی** / xafegî/: *اسم.* ١. خنکاوی؛ تاساوی؛ گەوخانی؛ تاسەنە؛ پشوونەماوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوون یان نەمانی هەوا بۆ هەناسەدان ٢. دۆخ یان چۆنیەتی تەسک بوونەوەی ڕێگای هات‌وچۆی گەڕۆکێ (وەک سووتەمەنی یان هەوا).

**خفه** / xafe/: *صفت.* ١. خنکاو؛ خنکیاگ؛ خنیکیاگ؛ خنیکیا؛ خنیکیاو؛ گەوخاو؛ تاسیاگ؛ خن؛ تووشی خنکاوی هاتوو ٢. خەفە؛ بێ هەوا یان ڕووناکی ئەوتۆ ‹اتاق خفه: دیوی خەفە› ٣. گیراو؛ گیریا؛ گیریاگ؛ گیریاو؛ خنکاو ‹صدای خفه: دەنگی گیراو›.

▣ **خفه شدن:** ١. کپ بوون؛ گیریان؛ بەسرانی ڕێگای هاتنی هەوا یان سووتەمەنی ٢. تاسیان؛ خنکیان؛ خنکان؛ خنجکان؛ خنیکیەی؛ خنیکیای؛ تاسیای؛ گەوخان؛ خەندقین؛ خەندقان؛ پشوو لێ بڕان؛ پشوو بڕان؛ هەناسە نەمان ٣. *[تعریض]* لاڵ بوون؛ بێ‌دەنگ بوون و قسە نەکردن ‹چرا خفه شدی؟ حرف بزن!: بۆ لاڵ بوویی؟ دەی قسە بکە!›.

**خفه کردن:** ١. خنکاندن؛ خنکانن؛ خنیکنەی؛ خنجکاندن؛ خەندقاندن؛ خەنقاندن؛ تاساندن؛ پشوو لێ‌بڕین؛ ڕێگەی هات‌وچۆی هەناسە لە گیانەوەرێ گرتن و بوونە هۆی گیان دەرچوونی ٢. کپ‌کردن؛ گرتن؛ بەستنی ڕێگای هاتنی هەوا یان سووتەمەنی ٣. *[تعریض]* بێ‌دەنگ‌کردن؛ کپ‌کردن؛ نق لێ‌بڕین؛ دەنگ بڕین ‹این رادیو را خفه کن!: ئەو ڕادیۆە بێدەنگ کە!›.

**خفه‌خون** / xafexûn/: [از عربی] ☜ **خَفَقان-٣**

**خفی** / xafî/: [عربی] *صفت. [ادبی]* نادیار؛ نەدیار؛ نەپەندی؛ نهێنی؛ پەنامەکی؛ بەرپێوار؛ نەپیویا ‹بیماری خفی: نەخۆشی نادیار›.

**خفیف** / xafîf/: [عربی] *صفت.* سووک؛ سۆک: ١. کەم؛ هندک؛ لاواز؛ بە کارتێکردنی کەمەوە

‹درد خفیف: ئێشی سووک› ٢. بێبایەخ؛ بێنرخ؛ پەست ‹چرا دوستت را پیش دیگران خفیف می‌کنی؟: بۆ هەواڵەکەت لە لای خەڵکەوە سووک دەکەی؟›.

**خفیه** /xofye/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ١. نهێنی؛ شاراوە؛ نادیار؛ نەدیار؛ بەرپێوار؛ نەپیویا ٢. نەناسراو؛ نەناسیاگ؛ نامۆ؛ نەناس؛ نەژناس؛ غەوارە؛ کەدە.

**خل** [1] /xol/: *اسم.* ژیلەمۆ؛ پووڵ؛ بووڵە؛ خوڵە؛ خۆڵەمێش؛ خۆڵەکەوە؛ خوەڵەکەوو؛ بەوروو؛ تۆزینە؛ مشکی؛ مۆر؛ سووتاوی لە ئاور بەجێماو.

**خل** [2] /ـها/: *صفت. [گفتاری]* حۆل؛ گێل؛ گۆل؛ هور؛ هاوی؛ نەفام؛ خول؛ سەرشێت؛ پەتیارە؛ گەللایی؛ کەللەیی؛ کەمئاوەز؛ سەفێح؛ لولسە؛ دەبەنگ؛ تەرەدین؛ گوەڕەنە؛ گواڕەنە؛ شێتۆکە؛ نیوە شێت؛ شەلوشێت؛ حەپش. هەروەها: **خل بودن؛ خل شدن**

**خلا** /xalā ، ـها/: [عربی] *اسم. [گفتاری]* دەسئاو؛ ئاودەس؛ ئاودەسخانە؛ سەرپێشاو؛ مەوال؛ مستەراو؛ مەستراو؛ کناراو؛ خەلا.

**خلأ** /xala'/: [عربی] *اسم.* بۆشایی؛ چۆڵایی: ١. شوێنێ کە هیچ ماکێکی تێدا نەبێ ٢. بار یان دۆخی چۆڵ بوونی جێگا یان شوێنێک لە ماک. بەرانبەر: **ملأ** ٣. دۆخی دوور بوون یان خاڵی بوون لە کارتێکەری هۆکارێک ‹خلأ سیاسی: بۆشایی ڕامیاری›.

◙ **خلأ سیاسی:** بۆشایی ڕامیاری؛ نەبوونی هێز یان کەسایەتی ڕامیاری کارا.

**خلأ فکری:** بۆشایی فیکری؛ نەبوونی بیری کارا و کارتێکەر.

**خلاب** /xalāb ، ـها/: *اسم.* ١. زۆنگ؛ زۆنج؛ زەلکۆ؛ زەلکاو؛ زلقاو؛ قۆپی؛ زق؛ زەوینی پڕ لە قوڕ و چلپاو ٢. گەنکاو؛ گەنیئاو؛ لەژمگە؛ لەزمان؛ زلیتاو؛ جلیتاو.

**خلاش** /xalāš ، ـها/: *اسم.* زن؛ زنە؛ قوڕەلیتە؛ زەوینی تەڕ و شل و کەزلانی.

**خلاص** /xalās, xelās/: [عربی] *صفت.* ئازاد؛ ڕزگار؛ ڕەها؛ فشە.

◙ **خلاص شدن:** ڕزگار بوون؛ ئازاد بوون؛ دەرباز بوون؛ خەلستن؛ خەلسین؛ نەفدین؛ ڤەرسین؛ فتلین ‹به هزار زحمت از دستش خلاص شدم: بە هەزار ناری عەلی لە دەستیەوە ڕزگار بووم›. هەروەها: **خلاص کردن**

**خلاصه** [1] /xolāse ، ـها/: [عربی] *اسم.* کورتە؛ پوختە؛ هەڵبژاردە؛ بژاردەی قسە؛ پوختەی وتار ‹خلاصه‌ی کتاب: کورتەی کتێب›.

**خلاصه** [2] /ـها/: *صفت.* کورت؛ بێشرۆڤە، ڕاڤە یان وردەکاری‌تر.

◙ **خلاصه کردن:** کورت‌کردن؛ کورت کردنەوە؛ کەم‌کردنەوەی وتار یان نووسراوە. هەروەها: **خلاصه بودن؛ خلاصه شدن**

**خلاصه** [3]: *قید. [گفتاری]* بە کورتی؛ بە پوختی ‹خلاصه من نمی‌توانم اینجا بمانم: بە کورتی من ناتوانم لێرەدا بمێنمەوە›.

**خلاصی** /xalāsî, xelāsî/: [عربی] *اسم. [گفتاری]* ڕزگاری؛ ئازادی؛ ڕەهایی.

◙ **خلاصی دادن:** پەڕاندنەوە؛ دەربازکردن؛ ئازاد کردن؛ قوتارکردن؛ بەردان؛ ڕزگارکردن؛ ڕاپەڕاندن؛ نەفداندن؛ نەفراندن؛ قەوتاندن؛ وەر دەی ‹چقدر به این در و آن در زدم تا توانستم تو را از زندان خلاصی بدهم: چەندە ئەم لا و ئەو لام کرد تا توانیم لە بەندیخانە دەربارت کەم›.

**خلاصی داشتن:** ڕزگاری هەبوون؛ ئازادی هەبوون؛ ڕەهایی بیەی ‹یک روز هم از دستش خلاصی ندارم: ڕۆژێکیش لە دەستی ڕزگاریم نیە›.

**خلاصی یافتن:** ڕزگاری هاتن؛ ڕزگار بوون؛ نەجات بوون؛ ئازاد بوون؛ فەتلین؛ نەفدین؛ ڕەها بیەی؛ داخەلسین ‹شوهرش مرد و او خلاصی یافت: شووەکەی مر و ڕزگاری هات›.

**خلاف** [1] /xalāf, xelāf ، ـها/: [عربی] *اسم.* ١. پێچەوانە؛ کار یان کردەوەی ناڕەوا، بە

پێچەوانەی داب و نەریتی کۆمەڵگا یان قانوون ۲. /حقوق/ کاری نالەبار کە سزای تەنیا چەن ڕۆژ زیندان یان بڕێ تاوانەیە.

◘ بر خلاف: پێچەوانە: ۱. بە پێچەوانە ‹او برخلاف پدرش، بسیار زیرک و کاری است: ئەو بە پێچەوانەی بابی، گەلێک وریا و لێهاتووە› ۲. بە شێوەی دژانە و یەکنەگر ‹برخلاف خواست او عمل شد: پێچەوانەی ویستی ئەو کارکرا›.

◘ خلاف رفتن: هەڵە چوون؛ بەرەو چەوتی و پێچەوانەی گەلەمپەری یان قانوون بزوان.

خلاف کردن: کفرکردن؛ کاری ناڕەوا کردن ‹خلاف که نکردەام، خواستم رادیو را درست کنم: خۆ کفرم نەکردووە، ویستم ڕادیۆکە چاک کەمەوە›.

خلاف گفتن: درۆکردن؛ ڕاست نەگوتن؛ درۆ گوتن؛ ڕاست نەدرکاندن ‹شاهد خلاف می‌گوید و پیداست که چیزی ندیده است: گەواکە درو دەکا و دیارە شتێکی نەدیوە›.

**خلاف** ^۲^: صفت. ۱. پێچەوانە؛ چۆپەوان؛ چەپیوانە ‹جهت خلاف: بەرەوگەی پێچەوانە› ۲. هەڵە؛ لار؛ نادروست ‹عمل خلاف: کاری هەڵە› ۳. چەوت؛ لاڕێ؛ هەڵەکار؛ سەرپێچکار ‹آدم خلاف: مرۆی چەوت›.

**خلافت** / xalāfat, xelāfat/: [عربی]/سم. جێ‌نشینی؛ جێگەداری: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی جێ‌نشین بوون ‹ایران در زمان خلافت حضرت عمر فتح شد: ئێران لە سەردەمی جێ‌نشینی حەزرەتی عومەردا گیرا› ۲. جێگە یان پێگەی جێ‌نشین ‹مأمون در سال ۱۹۲ هجری به خلافت رسید: مەئموون لە ساڵی ۱۹۲ کۆچیدا بە جێگەداری گەیشت›.

**خلافکار** / xalāfkār, xelāf-، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. سەرپێچکار؛ چەوتکار؛ پێچەوانەکار؛ هەڵەکار؛ لاڕێ؛ چەوت؛ گەنەکار؛ نادرووس؛ خاوەن ئاکاری ناڕەوا.

**خلافکاری** / xalāfkārî, xelāf-، ـها/: [عربی/ فارسی]/سم. هەڵەکاری؛ تاوانکاری؛ گەنەکاری.

**خلافی** / xalāfî, xelāfî، ـها/: [عربی]/سم. /گفتاری/ تاوان؛ تاوانکاری؛ سەرپێچکاری؛ چەوتکاری ‹اگر تا یک سال هیچ خلافی نداشته باشی، آزاد می‌شوی: ئەگەر تا ساڵێک تاوانێکت نەبێ، ئازاد دەکرێی›.

**خلاق** / xallāq/: [عربی] صفت. ۱. ئافرێنەر؛ بەدیهێنەر؛ خولقێنەر ‹خلاق جهان: ئافرێنەری جیهان› ۲. داهێنەر؛ خاوەن هێز یان توانایی ئافراندن ‹ذهن خلاق: زەینی داهێنەر› ۳. بەدیهێنەر؛ هۆی بەدیهاتنی شتێ تازە ‹کار خلاق: کاری بەدیهێنەر›: **خلّاقه**

**خلاقه** / xallāqe/: [عربی] ☜ **خلاق- ۳**

**خلاقیت** / xallāqîyyat، ـها/: [عربی]/سم. داهێنەری؛ داهێنەریەتی؛ بار و دۆخی داهێنەر بوون ‹در کارش خلاقیت زیادی داشت: لە کاریدا داهێنەریەکی زۆری هەبوو›.

**خلال** / xelāl, xalal/: [عربی]/سم. ۱. دوورینگ؛ دۆرینگ؛ مەودای کاتی؛ درێژەی ماوەی ڕەوتێک لە سەرەتاوە تا ئاخر ‹در خلال این مدت او رفته و برگشته بود: لە دوورینگی ئەم ماوەدا ئەو چووبوو و هاتبووەوە› ۲. خەڵتانە؛ خەلیلە؛ زلووک؛ زلووکە: /الف/ گیای دان ئاژن؛ گیایەکی لاسکناسکە، وشکی دەکەن بۆ ددان ئاژنین. ب/ هەرشتێ کە پانۆکە یان باریکەیێکیان لێ دەرهێنابێ ‹خلال بادام: خەڵتانەی بادام›.

◘ خلال دندان ☜ **خلال‌دندان**

در خلال: ۱. لە ماوەی؛ لە دوورینگی؛ لە مەودای کاتی ۲. لە نێوان؛ نێوان؛ لە ناو؛ ناو؛ دڵیو؛ لە درێژایی؛ بە درێژایی.

◘ خلال کردن: خەڵتانە کردن؛ کردنە زلووک؛ تاشین و وەک قاژی ناسک و باریکەڵە دەرهێنانی شتێ ‹تو پسته‌ها را خلال کن: تۆ بسەکان خەڵتانە بکە›.

**خلال‌دندان** / xalāldandān, xelāl-، ـها/: [عربی/ فارسی]/سم. زلووک؛ هیلال؛ چیلکەی دان

ئاژن؛ داناژن؛ باریکەییەکی چێوی یان لاستیکی بۆ خاوێن‌کردنەوەی ددان.

**خلانــدن** / xalāndan/: مـصدر. متعـدی. [ادبـی] //**خلاندی:** ئاژنیـت؛ **مـی‌خلانـی:** دەئـاژنی؛ **بخـلان:** بئاژنـه// ئـاژنین؛ ئـەژنین؛ ئاژەنـای؛ کۆڵـینەوە؛ چەقانـــدن؛ چـــەڤاندن؛ تـــێ‌چەقانـــدن؛ تێوەچەقانـدن؛ پێـدا چەقانـدن؛ پیـا چەقانـدن؛ ژەندنن؛ چەقنەی؛ تێـرۆکردنی شـتێکی (زۆرتـر نووک‌تیژ یان باریک) دە نێو شتێکی‌تردا (خلانـدن سـوزن: ئاژنینـی دەرزی). هـەروەها: **خلانیـدن**. **خلاندنی**

■ صفت فاعلی: **خلاننده** (ـ)/ صفت مفعولی: **خلانده** (ـ)/ مصدر منفی: **نَخلاندن** (نەئاژنین)

**خلانیدن** / xalānîdan/ ☜ **خلاندن**

**خلایــق** / xalāyeq/: [عربـی]/اسم. ١. [نامتـداول] ئافرێنراوان؛ بوونەوەران؛ خولقێنراوان؛ چێکراوان ٢. [گفتاری] خەڵک؛ خەڵکان؛ مەردم (خلایق هر چه لایق: خەڵک و کەڵکیان).

**خل‌بـازی** / xolbāzî، ـهـا/: اسم. گـەوج‌بـازی؛ گەلحۆیی؛ گێژی؛ دەبەنگ بازی؛ کاری بڵحانە و نەزانانە؛ کاری لاژگانە.

▣ **خــل‌بــازی درآوردن:** گــەوج‌بــازی‌کــردن؛ گەلحۆیی‌کردن؛ تێوەچوون بە کاری بـڵحانە و نەزانانەوە.

**خلبــان** / xalabān، ـهـا؛ ـان/: اسم. فڕۆکـەوان؛ فڕۆکـڤان؛ فڕۆکـەئاژۆ؛ خەلـەبان؛ ئـەو کەسـەی ئاژۆتنی فڕۆکەی بە ئەستۆیە.

**خلبانی** / xalabānî/: اسم. فڕۆکەوانی: ١. کـاری فڕۆکەوان؛ پیشەی فڕۆکە ئاژۆ ٢. کار یان ڕەوتی لێخوڕینی ماشینی بالگر.

**خلجــان** / xalacān، ـهـا/: [عربـی]/اسم. [ادبـی] ١. لــەرزە؛ ڕەوتی فــڕین؛ لــەرەی ناوێــستی ئەندامێک ٢. دڵەخورپێ؛ نیگەرانی؛ پەرێشانی.

**خلخال** / xalxāl، ـها/: [عربی]/اسم. ١. پـامووره؛ پامۆره؛ خرخاڵ؛ پاوێنە؛ پاهلە؛ خشڵێ بازنەیی لە کـانزای گـران، کـە ژنـان دەیکەنـە مەچـەکی پایانەوە ٢. [قدیمی] پاوەند؛ پاوەن؛ پاوەنە؛ پاوانە؛ ئەو ئاڵـەیە پێـی چوارپێیـان پـێ دەبەسـت بـۆ ئەوەی نەچن و وێڵ نەبن.

**خلد** / xold/: [عربـی]/اسم. [ادبی] ١. بەهەشـت؛ بەهشت ٢. ـ/ها/ مشکەکوێرە.

▣ **خلـد بـرین:** بەهەشـتی بـەرین؛ بەهەشـتی سەروو.

**خلر** / xollar، ـها/: اسم. پۆلـکە؛ پۆلـکە؛ گـاگوز؛ گاگۆز؛ گاگرووس؛ ولێره؛ ولەره؛ خولێره؛ خولیره؛ هـولیره؛ خلێـره؛ شـۆقل؛ گیایـەکی کـەلوودارە بەرەکەی وەک ماشی درشت دەچێ.

**خلسه** / xalse/: [عربی]/اسم. دۆخی نێوان خـەو و بێداری کە بە هۆی هەبوونی لۆرێکی زۆر خوش دەس دەدا (وەک دیتنی دیمەنێکی یەکجار جـوان لەگەڵ بیستنی ئاهەنگێکی دڵبزوێندا).

**خلص** / xollas/: [عربی] صفت. [ادبی] پاک؛ ڕووت؛ پەتی.

**خلط** / xalt/: [عربی]/اسـم. [نامتـداول] تێکـەلاوی؛ خەوش؛ کار یا دۆخی ڤەسـترانی شـتێ لەگـەڵ شتێکی دیکەدا.

▣ **خلـط مبحـث کـردن:** قـسە تێکـەڵ کـردن؛ تێکەڵ‌کردنی باسێک بە باسێکی‌تر (ما راجع بـه کار شرکت حرف می‌زنیم، چرا خلط مبحث می‌کنـی؟: ئێمە لەبارەی کاری بەشدارگەوە قسە دەکەین، بۆ قسە تێکەل دەکەی؟).

**خلـط** / xelt، ـهـا؛ اخـلاط/: [عربـی]/اسم. خـلـت: ١. [قـدیمی] هەرکام لە چوار تـوخمی لـەش کـە بـریتین لـە خـوێن، بەڵـغەم، سـەفرا و سـەودا ٢. بەڵـغەم؛ بـڵخەم؛ تراوێکـی زەرد و سـەوزی خەست کە لە سینە و قوڕگەوە دێتە دەرێ.

**خلـط آور** / xeltāvar/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. خڵت‌هێنەر؛ چـلک‌لابـەر؛ چڵک‌هەشـفێن؛ بـە تایبەتمەندی یان توانایی لا بردن و هەڵـکەندنی بەڵـغەم لـە دەزگـای هەناسـەدا (شـربت سینەی

خلطاور: شەربەی خلت هێنەری سنگ›.

**خلـع** /xal'/: [عربـی]/اسـم. ۱. کـار یـان ڕەوتی لابردن؛ کەڤاندن؛ کەنار خستن؛ لێسەندنەوەی پلە و پایە یان سەربەشانەیەک کـە بـە کەسـێ دراوە ۲. کاری داماڵین؛ داکەندن.

▣ **خلع درجه کردن**: پلەک لێ کەندنەوە؛ پلەک لێ ساندنەوە؛ لێ ساندنەوەی پلـەکی نیزامـی ‹به خاطر فرار از جبهه، او را خلع درجه کردند: بـە بۆنـەی دەرچـوون لـە شـەڕگەوە، پلـەکیان لـی کەندەوە›.

**خلع سلاح کردن**: چـەک کـردن؛ چـەک لـێ ساندن؛ ژ چەک کرن؛ چەک لـێ ئەسـتاندن؛ لێساندنی بەزۆری چەکی کەسـێ ‹نگهبـان را خلع سلاح کرده بود: پاسەوانەکەی چەک کردبوو›.

**خلع کردن از سلطنت**: لە پاشایەتی لابردن؛ لە پاشایی خستن؛ لە کار لابردنی پاوشا ‹مجلس مؤسسان احمد شاه را از سلطنت خلع کرد: کـۆڕی دامەزرێنەران ئەحمەد شایان لە پاشایەتی لابرد›.

**خلع لباس کردن**: بـەرگ لـە بـەر داکەنـدن؛ لێداکەندنی بەرگی تایبەتی (وەک هی ئەفسەر یان مەلا) بە مەبەستی تەمێکـردن یـان سـزا دان.

**خلع مقام کردن**: لە پلە و پایە خستن؛ لـەزێ لابردن؛ پلە و پایە لێساندنەوە.

**خلع ید کردن**: دەست کورتکردن؛ بـێدەس کردن؛ دەستەڵات بۆ نەهێشتن.

**خلعـت** /xal'at, xel'at/: [عربـی]/اسـم. [قـدیمی] ۱. بالاپۆشی پێشکەشی، بەتایبـەت گنجـێ کـە کەسـێکی گـەورەتر بـە چکۆلـەتری پێـشکەش کردبـا ۲. پارچـە یـان گنجـێ کـە لـە لایـەن بنەماڵـەی بووکـەوە بـۆ زاوا یـان بنەماڵـەی زاوا پێشکەش دەکرێ ۳. خـەڵاتی گـەورەپیاوان بـۆ ژێر دەستان؛ دیاری گـەورە پیـاوان ٤. [مجـازی] کفن؛ کەفەن.

**خلـف** [1] /xalaf/، اخـلاف: [عربـی]/اسـم. جێگـر؛ یاگەگیر؛ یاگەدار؛ جێنشین؛ پاشهات.

▣ **خلف صدق**: جێگری ڕاستەقینە.

**خلف** [2]: *صفت*. شیاو؛ جێگر؛ بەڕێوجـێ؛ شـیاوی جێنشینی ‹فرزند خلف: ڕۆڵەی شیاو›.

**خلـف** /xolf/: [عربـی] *صـفت*. ۱. پێچەوانـە؛ چۆپەوانە ۲. سەرپێچکار؛ چەوتکار؛ پێچەوانەکار؛ خراوەکێل.

▣ **خلف وعده کردن**: بێبەڵێنیکـردن؛ بەڵـێن بەجێ نەهێنان ‹هرگز ندیدم که خلف وعده بکنـد: قەت نەمدی بێبەڵێنی بکا›.

**خلفا** /xolafā/: [عربی] جمعِ ☜ **خَلیفه**

**خلفی** /xalfī/: [عربی] *صفت*. پـشتینە؛ پاشـین؛ پەشتین؛ پشتگین؛ پشتنگ؛ دوایـین؛ دواگـین؛ دمـایین. بەرانبـەر: **قُـدامی** ‹شـریان خلفـی: سووردەماری پشتینە›.

**خلـق** /xalq/: [عربـی]/اسـم. ۱. بەدیهێنـەری؛ داهێنەری؛ کـار و ڕەوتی خولقانـدن؛ ئافرانـدن؛ شێوراندن؛ بەدیهێنان ۲. /ـها/ خەڵک؛ خەڵـق؛ کۆمای مەردم.

▣ **خلق شدن**: ئافران؛ درووس بوون؛ بـەدیهاتن؛ هاتنە دی؛ چێ بوون؛ وەش بیەی.

**خلق کردن**: ئافراندن؛ دروووس‌کردن؛ ساز دان؛ وەدیهێنـان؛ بـەدیهێنان؛ چـێ کـرن؛ وەش کەردەی.

**خلق** /xolq/، ـها؛ اخلاق: [عربی]/اسم. خوو؛ خـدە؛ زێ؛ ئاکار؛ کردەوەی تایبەتی هەر کەس.

▣ **خلـق خـود را تنـگ کـردن**: *[مجازی]* وەڕەز بوون؛ جاڕز بوون؛ تووڕە بوون و تێهەڵـچوون ‹بیخود خلق خودت را تنگ نکـن: لـە خـۆڕا وەڕەز مەبە›.

**خلق کـسی تنـگ شـدن**: *[مجازی]* دڵـخورت بوون؛ دڵپڕ بوون و تێهەڵچوون؛ تووڕە بـوون ‹وقتی خلق پدرم تنگ می‌شود، زیر لب دعا می‌خواند: هەرکاتێ بابم دڵخورت دەبێ، لە بەر خۆیەوە دۆعا دەخوێنێ›.

**خلق کسی سر جایش آمدن**:*[مجازی]* هێور بوونەوە؛ سار بوونەوە؛ داسرەکیان ‹بنشین یک چای بخور تا خلقت سر جایش بیاید: دانیشە چایێک بخۆ با هێور ببیتەوە›.

**خلق‌الساعه** / xalqossā'e/: [عربی] *صفت.* دەم و دەس چێ بووگ؛ لە نەکاو بەدیهاتوو؛ گز و گومەت سەر هەڵداو؛ کوت‌وپڕ وەش بیە.

**خلق‌الله** / xalqollāh/: [عربی]*اسم. [مجازی]* ئاپۆرە؛ خەڵک؛ مەردم؛ مەردوم؛ مەخلۆق؛ گورتل؛ حەشامات.

**خلقان** / xolqān/: [عربی] *صفت. [ادبی]* تیتۆڵ؛ بزگور؛ شڕ؛ شڕ و شیتاڵ؛ شڕ و شیواڵ؛ پوویا؛ داڕزاو؛ داڕزیاگ؛ داڕزیاو؛ کۆنە و دڕاو.

**خلقت** / xelqat/: [عربی]*اسم.* ۱. کار و ڕەوتی ئافران؛ وەدیهاتن ۲. سروشت؛ سرشت؛ چۆنیەتی دروست بوونی بنەمای کەس یان شتێک.

**خلقی** / xalqî/: [عربی] *صفت.* خەڵکی؛ مەردمی؛ پێوەندیدار یان سەر بە خەڵکەوە.

**خلقی** / xolqî/: [عربی] *صفت.* ئاکاری؛ کردەوەیی؛ زێیی؛ پێوەندیدار بە ئاکارەوە.

**خلقیات** / xolqîyyāt/: [عربی]*اسم.* خۆ و خدە؛ ئاکار و ڕەوشت؛ کار و کردەوە؛ هۆرز و نیشت.

**خلل** / xalal, xelal/: [عربی]*اسم.* ۱. *[نامتداول]* کەلشت؛ قەڵشت؛ تریشکە؛ تلیش؛ درز؛ دەرز ۲. کەلی؛ وەزەن؛ وەزەنگ؛ گەزن؛ زیان.

▣ **خلل رساندن**: زیان‌گەیاندن؛ زیان لێدان؛ کەل کردن. هەروەها: **خلل رسیدن؛ خلل وارد شدن**

**خلل‌پذیر** / -xalalpazîr, xelal/: [عربی/ فارسی] *صفت. [ادبی]* ۱. گەزنگاز؛ زیان‌وەگر ۲. هەر شتێک کە بۆی هەیە خراو ببێ یان خەسار بچێ. هەروەها: **خلل‌پذیری؛ خلل‌ناپذیر**

**خلل و فرج** / xolal-o-forac/: [عربی]*اسم.* کون و درز؛ کون و قوژبن؛ قولچە‌ـقولچەیی ‹سنگ پا دارای خلل و فرج زیادی است: پاشۆر کون و درزی زۆری تێدایە›.

**خلم** / xe(o)lm/:*اسم. [قدیمی]* ۱. چڵم؛ چرم؛ تراوی خەستی کەپۆ ۲. ختیک؛ کەمێڵە؛ چڵمی وشکەوە بوو بە لووتەوە.

**خلمو** / xe(o)lmû/: *صفت.* چڵمن؛ چرمن؛ چڵمە؛ کڵمن؛ کلمیشۆک؛ لووت بە چڵمەوە.

**خلنج** / xalanc/: [معرب از فارسی] ☜ **خلنگ**

**خلنجزار** / xalanczār/: [معرب/ فارسی] ☜ **خلنگزار**

**خلنگ**[1] / xalang ، ـها/:*اسم.* چار؛ خەڵەنگ؛ گەسک؛ گزگ‌جاڕ؛ گیای گزگ: **خلنج**

**خلنگ**[2]: *صفت.* بازگ؛ بازی؛ بازە؛ دووڕەنگ؛ بەڵەک.

**خلنگزار** / xalangzār ، ـها؛ ـان/:*اسم.* چارەزار؛ گەسکجاڕ؛ ناوانێ لە زەوینی بۆرە کە گیاگزگ و پوار و گژ و گیای‌تری تێدا ڕواوە: **خلنجزار**

**خلواره** / xolvāre/:*اسم.* ژیلەمۆ؛ ژێڵەمۆ؛ زیلەمۆ؛ هەرو؛ ژێلی؛ خۆڵەمێشی گەرم کە هێندێک پشکۆی تێدا بێ.

**خلوت**[1] / xalvat/: [عربی]*اسم.* ۱. تەنیایی؛ تەنیایێ؛ تەنیاگی؛ دەرکەناری ‹در خلوت خویش به موضوع فکر کن: لە تەنیایی خۆتدا لە باسەکە بیرکەوە› ۲. *[نامتداول]* نەدیاری؛ نادیاری؛ بەرپێواری؛ پەنامەکی؛ نهێنی؛ شوێنی دوور لە خەڵک یان ئاپۆرە و پڕایی مەردم. بەرانبەر: **جَلوَت** ۳. چۆڵایی؛ خەڵوەت؛ جێگەی تەنیایی.

▣ **خلوت کردن**: تەنیایی‌گرتن؛ تەنیایی هەڵبژاردن؛ دەرکەناری‌کردن؛ دوورەپەرێزی کردن ‹در گوشه‌ای خلوت کرد و بدان اندیشید: لە کونجێکدا تەنیایی گرت و بیری لێ کردەوە›.

**خلوت**[2]: *صفت.* چۆڵ؛ چووڵ؛ چۆڵ و هۆڵ؛ دینج؛ خەڵوەت؛ دوور لە جەنجاڵ.

▣ **خلوت بودن**: چۆڵ بوون؛ خەڵوەت بوون؛ خالی یان بێ‌گوڕمۆڕ بوون ‹خیابان خلوت بود:

شەقام چۆڵ بوو›. هەروەها: **خلوت شدن**

**خلوتخانه** / xalvatxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* چۆڵـخان؛ دینجخانە؛ دنجخانە؛ شوێنی تایبەت بە خەڵوەت کردن: **خلوتکده؛ خلوتسرا**

**خلوتسرا** / xalvatsarā/: [عربی/ فارسی] ☜ **خلوتخانه**

**خلوتکده** / xalvatkade/: [عربی/ فارسی] ☜ **خلوتخانه**

**خلوتگاه** / xalvatgāh ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* چۆڵگا؛ چۆڵەوانی؛ چۆلایی؛ چۆلانی؛ خەڵوەتگە.

**خلوتنشین** / xalvatnešîn ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ۱. دوورەپەرێز؛ چۆڵنشین؛ خەڵوەنشین؛ چۆلانینیش؛ چۆڵگەماو؛ چۆڵگەمەن؛ تایبەتمەندی کەسێ کە لە تەنیاییدا دەژی ‹زاهد خلوت‌نشین دوش به میخانه شد: زاهیدی دوورەپەرێز دوێشەو چوو بۆ مەیخانە› ۲. تەنیا؛ ڕەبەن؛ سەڵت.

**خلوتی**[1] / xalvatî/: [عربی] *اسم.* چۆلایی؛ چۆڵی؛ خەڵوەتی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی چۆڵ بوون ‹جای به این خلوتی پیدا نمی‌کنی: جولاییێکی ئاوات دەست ناکەوێ›.

**خلوتی**[2]: *صفت.* ۱. چۆڵنشین؛ خەڵوەنشین؛ چۆلانی‌نیش ۲. سەڵت؛ ڕەبەن؛ تەنیا.

**خل و چل** / xol-o-čel/: *صفت. [گفتاری]* گێژ و وڕ؛ گێژ و وێژ؛ گێج و وێج؛ وڕگێج؛ گێڕ و گێج؛ وڕ؛ لەودە؛ لەوچ؛ بێ هۆش و هێزی پێویست بۆ باش جێبەجێ‌کردنی کار ‹مغازه را دادی دست این داماد خل و چل؟: دووکانەکەت دایە دەستی ئەم زاوا گێژ و وڕەت؟›.

**خلوص** / xulûs, xolûs/: [عربی] *اسم.* پاکی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی پاک بوون ‹برای تعیین میزان خلوص به آزمایشگاه فرستاده شد: بۆ دیاری‌کردنی ڕادەی پاکی نێردرا بۆ تاقیگە› ۲. پاکژی؛ بێ خەوشی ‹خلوص نیت: پاکی دڵ و دەروون›.

**خل‌وضع** / xolvaz'/: [فارسی/ عربی] *صفت. [گفتاری]* گەناژ؛ گەناچ؛ گەن‌ئاژە؛ سڕ و وڕ؛ سڕ و سەپۆڵ؛ هەش‌چالاکی؛ گەللایی؛ سەرشێت؛ خاوەن ئاکار یان ڕواڵەتی گەوجانە ‹فروشنده قدری خل‌وضع بود: فرۆشەرەکە تۆزێ گەناژ بوو›.

**خلیج** / xalîc ، ـها/: [عربی] *اسم.* درناو؛ درنال؛ دەلاو؛ ڕۆ؛ کەنداو؛ لاوچ؛ خەلیج؛ پێشەوە چوونی ئاو لە وشکانیدا.

**خلیدن** / xalîdan/: *مصدر. لازم. متعدی. [ادبی]* //**خلیدی**: چەقیت؛ **می‌خلی**: دەچەقیت؛ **بخل**: بچەقە// ▢ *لازم.* ۱. چەقین؛ پێداچەقین؛ تێ‌هەڵچەقین؛ تێ‌هەڵچوون؛ پێداچەقان؛ تێ‌چەقان؛ تێ ڕۆ چوون؛ داچەقان؛ پیاهەڵچەقین؛ ئەنەچەقەی؛ تێڕۆ چوونی شتێکی (زۆرتر نووک تیژ یان باریک) دە نێو شتێکی دیکەدا ▢ *متعدی.* ۲. *[مجازی]* خزین؛ خزیان؛ ئەنەخزەی؛ بە شێوەیێکی نادیار چوونە نێو شوێنێ یان شتێکەوە.

■ صفت فاعلی: **خلنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **خلیده** (چەقیو)/ مصدر منفی: **نخلیدن** (نەچەقین)

**خلیفه** / xalîfe ، ـها؛ ـگان؛ خلفا/: [عربی] *اسم.* ۱. *[نامتداول]* جێ‌نشین؛ جێگر؛ جێگرەوە؛ یاگەگیر؛ یاگەدار؛ یاگەنیش؛ خەلیفە ۲. سەرکارگەر؛ سەرکارگەری کار و پیشە کۆنەکان.

**خلیق** / xalîq/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ئاکارچاک؛ چاکەکار؛ ڕەوشت‌بەرز.

**خلیلی** / xalîlî/: [عربی] *اسم.* خەلیلی؛ جۆرێ ترێی کارەبایی دانەدار کە زووتر پێدەگا.

**خم**[1] / xam/: *اسم. [ادبی]* خواری؛ چەم؛ خەم؛ چەماوی؛ چەمی؛ پێچ‌وپلووچی؛ پێچ و لوولی؛ چەوت و چێلی؛ خوارەکە و پێچکە؛ نووشتاوی.

▣ **خم به ابرو نیاوردن**: *[مجازی]* بە بای خەیاڵدا نەهاتن؛ نەخستنە خۆ؛ بە خۆ نەزانین؛ خۆ لێڵ نەکردن؛ هەڵگرتنی دژواری و سەخڵەتی

بێ ختە و بۆڵە ‹صد کیلو بار را بلند کرد و خم بە ابرو نیاورد: سەد کیلۆ باری هەڵگرت و بە بای خەیاڵیدا نەهات›: **ابرو خم نکردن** ☜ **ابرو**

**خم شدن:** چەمان؛ چەمانەوە؛ چەمینەوە؛ ڤەچەمان؛ ڤەچەمیان؛ نووچانەوە؛ نووچیان؛ نووچیانەوە؛ نووشتانەوە؛ نەوین؛ بوونەوە؛ دانەوان؛ دانەوین؛ چەوتانەوە؛ کۆم بوونەوە؛ کۆمەو بوون؛ لار بوونەوە؛ خوار بوونەوە؛ تا بوون؛ داهاتنەوە؛ داهاتن؛ مووچیانەوە؛ نەوی قەدبوون؛ نەمیانەوە؛ دانەوینەوە؛ نامیایرە؛ ئەرەنامیەی؛ کۆمیایرە؛ قولزاندن؛ قولزین؛ چفان؛ لە باری ڕێک و ڕاستی هاتنە دەرەوە ‹خم شدم، سکه را از روی زمین برداشتم؛ میله خم شد: دانەویم و سکەکەم لە زەوی هەڵگرت؛ میلەکە چەمایەوە›. هەروەها: **خم کردن**

**در خم یک کوچه بودن:** *[مجازی]* هێشتا لە سەرەتای ڕێگا یان کاردا بوون.

**خم**[۲]: *صفت.* چەماو؛ چەماوە؛ چەفت؛ چەم؛ خەم؛ نووچ؛ مووچ؛ لار؛ کۆم؛ دلا؛ کوور ‹پشت خم: پشتی چەماو›.

**خم** / xom ، ـها/: *اسم.* هوومە؛ هومە؛ کووپە؛ کوپە؛ کووپێ؛ کوار؛ کوپ؛ خومالیک؛ خوم؛ کلووس؛ خنوسی؛ خاروف؛ دەفری سواڵەتی زل و دەم ئاواڵە.

▣ **خم رنگرزی:** ۱. *[قدیمی]* خم؛ هوومە؛ هومە؛ خمخر؛ کووپەیێ کە ڕەنگڕێژان ڕەنگیان تێدەکرد و بەن یان قوماشیان پێدا دەژەند ڕەنگبگرێ ۲. *[کنایی]* کاری بە هەڵە داوان؛ بە پەلە و بێتێڕامان کار کردن.

**خمار** / xammār/: [عربی]*اسم.* مەیفرۆش؛ کەسێ پیشەی فرۆشتنی خواردنەوەی ئەلکولیە.

**خمار** / xomār/: [عربی] *صفت.* خاو؛ خومار: ۱. خەواڵوو ‹چشم خمار: چاوی خومار› ۲. مەدلمە؛ خوماری پێوەپێچیاو ‹تریاکش نرسیده، خمار است: تلیاکی پێ نەگەیشتووە، خاوە›.

**خمارآلود** / xomārālûd/: [عربی/ فارسی] *صفت.* خومار؛ خاو؛ بێ هەست و هێز.

**خماری** / xomārî ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ۱. خەواڵوویی ۲. خاوی؛ خوماری؛ دۆخی دەس نەگەیشتن بە کەرەسەی خوو پێوەگرتوو؛ سەرئێشەی دوای سەرخۆشی ‹با یک نخود تریاک او را از خماری در آورد: بە نۆکێک تلیاک، لە خاوی دەری هێنا›.

**خماندن** / xamāndan/: *مصدر. متعدی.*// **خماندی:** چەماندت؛ **می خمانی:** دەچەمێنی؛ **بِخمان:** بچەمێنە// چەماندنەوە؛ چەماندن؛ چەمانن؛ قولزاندن؛ ڤەچڤاندن؛ چەمنەی؛ چەمنایوە؛ ئەرەکۆمنەی؛ چەوتاندنەوە؛ مووچاندنەوە؛ نوشتاندنەوە؛ نەواندن؛ کوورکردن: **خمانیدن**

■ صفت فاعلی: **خماننده** (چەمێنەر)/ صفت مفعولی: **خمانده** (چەمێنراو)/ مصدر منفی: **نَخماندن** (نەچەماندن)

**خمانیدن** / xamānîdan/ ☜ **خماندن**

**خمپاره** / xompāre ، ـها/: *اسم.* قومپارە؛ جۆرێک گوللەی تۆپ ئاسا کە بەر لەوەی بگاتە زەوی دەتەقێتەوە و پرزەی زۆری لێدەبێتەوە.

**خمپاره‌انداز** / xompāre'andāz ، ـها/: *اسم.* هاوان؛ جۆرێ تۆپی سووک بۆ هاویشتنی قومپارە.

**خمپذیر** / xampazîr/: *صفت.* چەمانی: ۱. بە تایبەتمەندی یان توانای لار و ڕاستەوە بوونەوە، بێ ئەوەی درز بەرێ یان بشکێ ۲. بە تایبەتمەندی یان هێزی وەک خۆ لێ هاتنەوە.

**خمپذیری** / xampazîrî/: *اسم.* چەمانەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی چەمانی بوون.

**خمچه** / xomče ، ـها/: *اسم.* گوسک؛ گۆزک؛ کووپەڵە؛ کەدینک؛ قوم؛ بستووکە؛ گۆزەی بچووک؛ دەفری سواڵەتی خڕکەڵە.

**خمخانه** / xomxāne ، ـها/: *اسم.* ۱. *[قدیمی]* خومخانە؛ ژێرخانێک خومی شەرابی تێدا

هەڵــدەگرن ٢. *[کنــایی]* مەیخانــە؛ شــوێنی خواردنەوەی شەراب.

**خمـر** / xamr ، ـها/: [عربـی]/*اسـم. [فقـه]* شـەراو؛ شەراب؛ نۆشابەی ئەلکولی.

**خمره** / xomre ، ـها/:*اسـم.* لینـە؛ لینـک؛ لـین؛ کووپەی گەورەی سواڵەت ‹در جریان کـاوش چنـد خمرەی خالی پیدا شد: لـە ڕەوتی گـەڕان و پـشکنیندا چەند لینەی خاڵی دۆزرایەوە›.

**خمس** / xoms/: [عربی]/*اسم.* ١. یەک لـە پێـنج؛ بەشــێ لــە پێــنج بــەش ٢. *[شـیعه]* خــومس؛ پێنجیەک؛ پێـنجیـەکی داهـات کـە دەدرێ بـە جێگری ئیمام یان سەیدی هەژار.

**خمسه** / xamse/: [عربـی] *صـفت. [ادبـی]* پێنجـە؛ پێنجی؛ پێنجدانەیی؛ بە شێوەی پێنج بەشی لـە یەک کۆمەڵەوە.

**خمش** / xameš/:*اسـم.* چـەماوی: ١. کـار یـان ڕەوتی چەمانــەوە؛ چــەمان؛ چـڤان؛ چــەمین ٢. دۆخ یان چۆنیەتی چەماو بوون؛ کـۆم بـوون؛ کووڕ بوون.

**خمکـاری** / xamkārî ، ـهـا/:*اسـم.* چـەمکاری؛ کارێک لە کانزاکاریـدا بـۆ چەماندنـەوەی پـەڕە، تیکە یان لوولەی لە کانزا.

**خمودگی** / xamûdegî ، ـها/: (!) [عربی/ فارسـی] *اسـم.* ١. پــەژارەیی؛ خــەمۆکی ٢. خــەوخانی؛ داهێــزراوی؛ داچــەکاوی؛ تــەوەزەلی؛ خــاوی؛ سلپی؛ بێحاڵی؛ بێتاقەتی.

**خمـوده** / xamûde/: (!) [عربـی/ فارسـی] *صـفت.* ژاکاو؛ داهێزراو؛ داچەکاو؛ سڕ؛ سست؛ بێحـاڵ و دڵمردوو.

**خمــودی** / xamûdî/: (!) [عربــی/ فارســی]/*اســم.* ژاکاوی؛ خەوفانی؛ داهێزراوی؛ بـێحاڵـی و بـێ هەست و نەستی.

**خموش** / xamûš/: *صفت. [مخفف، ادبی]* خمـۆش؛ ئامۆش؛ خامۆش: ١. بێدەنگ؛ قـڕ و قـپ ‹گفتا خموش حافظ! کاین غصه هم سرآید: گوتی بێدەنگ بە حــافیز! ئــەم مەینەتــەش دەتــارێ› ٢. کــوژاوە؛ دامرکاو.

**خمیــازه** / xamyāze ، ـهــا/:*اسـم.* باوێــشک؛ باوشک؛ بلووشک؛ باوشکێن؛ بارێشک؛ گرکەش؛ وەلایــش؛ دەبانــک؛ دەبــەنک؛ دەمــەکاوەکی؛ دەمەکەوکی؛ قەجەڕە؛ قەدجەڕە؛ ژاژک؛ ئاژاژک؛ ئاژاژکی؛ ئاژئاژە؛ ئاژاشکە؛ ئارۆشک؛ وێژە؛ وێـژێ؛ وێژینگ؛ وێژنـگ؛ کـشکەوڕ؛ کیژکـاوڕ؛ نـشکێ؛ کەشکەلان؛ خەوەشکێ؛ ڕەوتی هاتنە دەرەوەی ناویستی و قووڵی هەناسە وێڕای کرانـەوەی زار، لە بەر ماندوویی، خەواڵویی یان بێتاقەتی.

▣ **خمیازه کشیدن:** باوێـشک دان؛ باوشـک دان؛ وێـژەرە ئاسـەی؛ وێـژە ئاسـەیرە؛ ڤـەتراندن؛ بهنژین؛ هۆنژین؛ دەمەکەوکی کـردن ‹بـسیاری از شنوندگان بـە خمیـازە کـشیدن افتادنـد: زۆرێ لـە بیسەران، کەوتنە باوێشک دان›.

**خمیـدگی** / xamîdegî ، ـهـا/:*اسـم.* چـەماوی؛ چەمیاگی.

**خمیـدن** / xamîdan/: *مـصدر. لازم.* // **خمیـدی:** چەمایت؛ **خم میشوی:** دەچەمی؛ **خمشـو:** بچەمـە// چــەمان؛ چەمانــەوە؛ چەمیانــەوە؛ چەمینــەوە؛ چەمین؛ چەڤـین؛ چەمیـەی؛ نوینـەوە؛ نـەوان: ١. قـۆپ بـوون؛ قـۆزین؛ قـۆز بـوون؛ قـولزین؛ داهــاتن؛ دانــەوین؛ داهاتنــەوە؛ ئەرەنامیــەی؛ نامیـەیرە؛ ئەرەکۆمیـەی؛ کۆمیـایرە؛ لـە دۆخـی ڕاسـت و ئەسـتوونی تـرازان؛ لـە قـنج و قـیتی دەرهاتن ٢. گیڕ بـوون؛ لار بـوون؛ لار بوونـەوە؛ لارەو بـوون؛ لارەوە بـوون؛ شـەوین؛ فـاق دان؛ خوار بوون ٣. ڤەچەمیان؛ ڤـەچەمان؛ نووشـتان؛ فاق دان؛ مووچان؛ مووچیەی؛ لار و گیـڕ بـوون؛ پێچەڵپێچ بوون؛ قەمچ و پێچ خواردن؛ لار و وێر بیەی؛ چەفت و چێڵ بوون. هەروەها: **خمیدنی**

■ **صفت مفعولی: خمیـده** (چـەماو)/ مـصدر منفـی: **نَخمیدن** (نەچەمان)

**خمیده** / xamîde ، ـها/: *صفت.* چەماوە؛ چەلەک؛

چەمیوە؛ چەمیو؛ چەمووڕ؛ چەمیایە؛ چەوتاوە؛ چەم؛ چەمتاو؛ چەڤی؛ چەوت؛ چەفت؛ چەفتچڵ؛ چڤیای؛ داهاتوو؛ ئورووف؛ خوارەوە بووگ؛ لارەوە بووگ؛ تم؛ تماو؛ دوولا؛ نوشتاوە؛ شەوین؛ قۆق؛ قۆغ؛ قلووچ؛ کووڕ؛ کەر؛ لار؛ شەڤ؛ شەڤی؛ شەڤین؛ قۆقز؛ کۆم؛ قۆخ؛ قۆپ؛ قاخ ‹پشت خمیده: پشتی چەماو›.

**خمیر** / xamîr ، ـها/: [عربی]/اسم. هەویر؛ هەڤیر؛ هەمیر؛ میر؛ خەیویر؛ خەور؛ خەوری؛ پات؛ تێکەڵاو یان تێوەردراوێکی نەرم و شێوازگر: *الف)* ئاردی لە ئاوکراوی شێلدراو بۆ نان پێتن ‹خمیر نان: هەویری نان› *ب)* خۆڵەسوورە یان گەچ کە بۆ سواڵەت، پێکەرسازی و... تێکەڵ بە ئاو کراوە ‹خمیر مجسمەسازی: هەویری پەیکەرسازی› *ج)* ماکی دەوایی، تەندروستی یان پیشەیی ‹خمیر ریش: پاتی ریش›. هەروەها: **خمیر شدن؛ خمیر کردن**

◙ **خمیر ترش** ☜ **خمیرمایە**

**خمیر دندان** ☜ **خمیردندان**

**خمیر ریش** ☜ **خمیرریش**

**خمیر کاغذ**: هەویری قاقەز؛ هەویر کاغەز؛ هەویری بەرهەمهاتوو لە ناوکەی چێو و ڕیشاڵەی گیا، بۆ چێکردنی کاغەز.

**خمیردندان** / xamîrdandān ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. خەمیرددان؛ هەویری پێکهاتوو لە ماکی خاوێنکەرەوە بۆ شتنی ددان.

**خمیرریش** / xamîr(e)rîš ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. پاتی ریش؛ خەمیر ریش؛ هەویری ریش‌تاشین؛ هەڤیری ئاوێتە بە ماکی سابوونی و بۆنخۆش بۆ ریش‌تاشین.

**خمیرسانی** / xamîrsānî/: [عربی/ فارسی]/اسم. هەویرئاسایی؛ تایبەتمەندی هەویرێک کە بە هەر دەقێکی دەربێنی هەروا بمێنێتەوە و نەچێتەوە سەر بیچمی پێشووی.

**خمیرگیر** / xamîrgîr ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. هەویرگیر؛ هەڤیرکەر؛ هەویرشێل؛ هەڤیرشێل؛ هەمیرشێل؛ هەمیرشێلە؛ کەسێ کاری بەرهەڤکردنی هەویری نان (یا نانی شیرینی) بێ.

**خمیرمایە** / xamîrmāye ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. هەوێن؛ هێڤین؛ هەیان؛ هەڤیان؛ هامێن؛ هاڤێن؛ ئاڤین؛ فرسک؛ میراز؛ لەپۆ؛ لیندو؛ خەمیرە؛ مادە؛ مایە؛ هەویرترشی هۆی هەڵهاتنی هەویری تازە: **خمیرترش**

**خمیرە** / xamîre/: [عربی]/اسم. سروشت؛ خێم؛ هێم.

**خمیری** / xamîrî ، ـها/: [عربی] *صفت*. هەویری؛ هەڤیری؛ وەک هەویر؛ خاوەن دۆخ یان حاڵەتی نەرم و شێوازگر ‹مادەی خمیری: ماکی هەویری›.

**خنازیر** / xanāzîr/: [عربی]/اسم. غەنازیلە؛ غەنازیر؛ خەنازیر؛ خەنازیل؛ کۆمەڵە لکی لەنفاوی مل کە برێ جار زۆر گەورە دەبنەوە.

**خناق** / xonnāq/: [عربی]/اسم. پێران؛ دووشاخە؛ تاس؛ بەغمە؛ بوغمە؛ ملەخڕە؛ ملەخڕێ؛ وەناق؛ خرالە؛ نەخۆشی هەناسەبڕان.

**خنثا** / xonsā ، ـها/: [عربی] *صفت*. بێبار: ١. بێبەر؛ بێ کارتێکری یان کارهاتی بەرچاو ‹تلاش خنثا: کردوکاشی بێبار› ٢. *[زیستشناسی]* نێرەمووک؛ نێرەمووک؛ نێرەمۆک؛ نێرمۆ؛ نێرمووک؛ نە نێر نە مێ؛ بە بێ ئەندامی ڕەگەزی گەشەدار ٣. *[فیزیک]* بە بێ باری ئیلیکترۆمیغناتیسی ‹مادەی خنثا: ماکی بێبار› ٤. *[شیمی]* بێ کارکۆیی ئەسیدی یان بازی ‹نمک طعام مادەای خنثاست: خوێ ماکێکی بێبارە› ❋ **خنثی**. هەروەها: **خنثا بودن؛ خنثا شدن؛ خنثا کردن**

**خنثاسازی** / xonsāsāzî/: [عربی/ فارسی]/اسم. کار یان ڕەوتی بێ بارکردن.

**خنثی** / xonsā/: [عربی] ☜ **خُنثا**

**خنج** / xanc ، ـها/: /اسم. *[گیاەشناسی]* بەرزەلەنگ؛ بەرزەلەنگ؛ زەنگۆڵەگیا؛ کلاوزرە؛ برینجداس؛

گیابەرک؛ بنەگیاییێکی خۆرسکە بە لقی باریک و گەڵای وردی تێکئاڵاوی کوڵکن و گوڵـی ورد و تۆپـەڵــتۆپەڵـی بۆنخـۆش و هێنـدێک تـاڵ و تفتەوە.

**خنج** / xenc/: *اسـم.* ١. خـەش؛ خاشـە؛ ڕووکـە؛ کێرە؛ ڕیش ٢. *ـها/[گیاەشناسی]* پێکۆڵ؛ پەیکوڵ؛ پەیکولە؛ پێکولی؛ پەیکولی؛کونجرکە؛ قونجرکە؛ درەسـووچە؛ سـێچـوکڵ؛ سـێددان؛سـێدان؛ دڕکێکی سێسووچە بە زەویدا پان دەبێتەوە.

**خنج** / xonc ، ـها/: *اسم. [گیاەشناسی]* وەن؛ وەنی؛ دارەوەن؛ دارەبــەن؛ ونەمــشک؛ وەنەمــشک؛ وەنەمــشکی؛ بنەوەشـیلە؛ وەنـەوش؛ کولـەنگ؛ کولینگ؛ وەناوشەک.

**خنجـر** / xancar ، ـهـا/: [عربـی]*اسـم.* خنجـەر؛ خنجێــر؛ خــەنجێر؛ خەنجــەر؛ خەنجــەرە؛ خەنجۆک؛ تـووژگ؛ شـینەتێخ؛ خینگـر؛ بدگـە؛ کێردی گەورە و خواری زۆرتر پۆڵایین بە نووک و تێخی دوولا تیژەوە.

▣ **خنجـر** زدن: خەنجـەر لێـدان؛ بـە خەنجـەر کوتان.

**خنجـر** کـشیدن: خنجەرکێـشان؛ خنجـەر لـە کالان دەرهێنان و گیفکردن.

**خنجــه** / xance/: *اسـم.* ئانیــسک؛ هەنیــسک؛ هەنسک؛ هەسکە؛ دەنگێکـە لـە خۆشـیان یـان پاش گریان لە قوڕگەوە دەردێ.

**خنجیــر** / xencîr/: *اسـم.* چەقـەوڕ؛ بـۆ کـرووز؛ بـۆیێکی تونـد و وەڕسـکەرە بەتایبــەت لــە هەڵقرچانی ماکی چەوریدارەوە هەڵدەسێ.

**خنچه** / xonče/ ☜ **خوانچه**

**ـخند** / xand/: *پیوازە.* ــخەنـە؛ ـخەنـد؛ ــخـوە؛ ــگەشـە؛ ـبـزە؛ ـکـەنی؛ ـکـەنین ‹شـکرخند: زردەخەنە›.

**خنــــدان**[1] / xandān/: *صـــفت.* ١. خــــەنۆڵ؛ خەنـدەران؛ خەنــەران؛ ڕوولکــەن؛ ڕووخــۆش؛ ڕووگەش؛ دەم بە پێکەنین ٢. *[مجازی]* پشکۆتوو؛ گەشـاوە؛ تـەنگیا؛ دەمـداوە ‹گـل خنـدان: گوڵـی پشکوتوو›. هەروەها: **خندان بودن؛ خندان شـدن؛ خندان کردن**

**خندان**[2]: *قید.* بە پێکەنینـەوە؛ بـە پێکـەنین؛ بـە خوایوە ‹خندان پیش آمد و مـرا در آغـوش گرفـت: بـە پێکەنینەوە هاتە پێشێ و باوەشی پێمدا کرد›.

**خندانــــدن** / xandāndan/: *مــصدر. متعــدی.* // **خندانـدی:** کەنانـدت؛ **مـیخنـدانی:** دەکـەنێنی؛ **بخندان:** بکەنێنە// کەناندن؛ خەنانـدن؛ خوونـەی؛ خۆنەی؛ وە پێکەنین هێنان؛ هاندان بۆ پێکەنین یان هۆی کەنین پێکهێنان ‹خنداندن مـردم، کـار سادەای نیست: کەنانـدنی خەڵـک، کـارێکی هاسـان نیە›: **خندانیدن.** هەروەها: **خنداندنی**

■ صـفت فـاعلی: **خندانـنـده** (کەنێنـەر)/ صـفت مفعولی: **خندانده** (کەنێنراو)/ مصدر منفی: **نخنداندن** (نەکەناندن)

**خندانیدن** / xandānîdan/ ☜ **خنداندن**

**خنـدق** / xandaq ، ـهـا/: [معـرب از فارسـی]*اسـم.* کەنەک؛ کەندەک؛ کەندە؛ کـۆزک؛ تـاپی؛ بـاهو؛ هەرق؛ ڕەهەند؛ خەرەند؛ خەنـدەک؛ خەنـدەق؛ خەنـەق؛ خەنـەک؛ خەنـدۆر؛ چاڵـی دەسـکرد، بەتایبەت قووڵگەییێکی درێـژ کـە بـە مەبەسـتی بەرەنگاری هەڵدەکەنرێت.

▣ **خندق بلا:** *[تعـریض]* کادان؛ کادانە؛ ئەشـقەمە؛ مەشکەڕەش؛ ورگ؛ سک؛ زگی دوا بڕیاگ.

▣ **بـە خنـدق بـلا سـرازیر کـردن:** *[تعـریض]* هەڵــمەقووتکــردن؛ لەڕپانــدن؛ ماشــتنەوە؛ دەنـک لـێ نەهێـشتنەوە؛ قرتـە لـێ بـڕین؛ هەڵلووشین؛ چڵەپنەی؛ لەپنای ‹آن همه میوه را به خندق بلا سرازیر کردی؟!: ئەو هەمکە میـوەت هەڵمەقووت کرد؟!›.

**خنده** / xande ، ـها/: *اسم.* خەنە؛ خەندە؛ خەنین؛ خۆه ؛ خـوە؛ کـەن؛ کـەنی؛ کـەنین؛ پێکـەنین؛ پێخەنین؛ هو؛ هەو؛ پەنەوا؛ وەیـایش؛ هـەوایش؛ هواتـەیش؛ هـوواتش؛ ویـی؛ ویـەیش؛ بـسکە؛

بارێکی تایبەت لە ڕوومەت، نەوازا لە لێو و چاودا، کە زۆرتر بە هۆی شادیەوە بەدی دێ، لەگەڵ دەنگی نزم یان بەرزدا.

▣ **خنده‌ی زورکی:** پێکەنین نەبەدڵ؛ پێکەنینی بەزۆری.

**خنده‌ی نخودی:** کشمیشی پێکەنین؛ پریکە؛ پلیکە؛ تریقە؛ پێکەنینێ لەگەڵ دەنگی هێواش و پچڕ- پچڕدا.

▣ **خنده سردادن:** تریقانەوە؛ بە قاقا پێکەنین؛ قلیانەوە؛ حیلکانەوە؛ هیلکانەوە؛ قلیایوە؛ ئەوەقلیەی؛ خەنینەوە؛ بە دەنگی بەرز و قەو پێکەنین ‹با دیدن من خنده سر داد: کە منی دیت تریقایەوە›.

**خنده گرفتن:** پێکەنین هاتن؛ پێکەنین بۆ هاتن؛ خەنە زۆر بۆ هێنان؛ خوەی‌گێرتەی؛ خوە پەی ئامەی ‹خنده‌اش گرفته بود و نمی‌توانست جلوش را بگیرد: پێکەنینی دەهات و نەیدەتوانی بەری بگرێ›.

**از خنده روده‌بر شدن:** *[مجازی]* مردن لە پێکەنیندا؛ لە پێکەنینا برک کردن؛ دڕان لە پێکەنیندا؛ لێک‌بوونەوە لە بەر پێکەنین؛ لە کەنینا ناوسک بڕیان؛ جە خوەینە چوێ شیەی ‹آن شب همه از خنده روده‌بر شدیم: ئەو شەوە هەموومان مردین لە پێکەنیندا›.

**به خنده افتادن:** کەوتنە پێکەنین؛ پێکەنین لێ پرژان؛ کەوتنە خەنین؛ هاتنە کەنین ‹از حرفش بە خنده افتادم: لە قسەکەی کەوتمە پێکەنین›: **به خنده انداختن**

**خنده‌آور** / xande'āvar/: *صفت.* پێکەنینی؛ کەنینی؛ پێکەنین‌هێن؛ هۆی بزواندنی بزە ‹کارهایش خنده‌آور بود: کارەکانی کەنینی بوو›.

**خنده‌دار** / xandedār/: *صفت.* پێکەنین‌دار؛ کەنین‌دار ‹حرف خنده‌دار: قسەی پێکەنین‌دار›.

**خنده‌رو** / xanderû، ـها/: *صفت.[گفتاری]* خەنەران؛ خەنەرانە (بۆ مێینە)؛ ڕووکەن؛ کەنۆک؛ دەڤ کەنۆک؛ ڕووخۆش؛ ڕووگەش؛ دەم بەبزە؛ دەم بەپێکەنین؛ دەم بەپێخەنین ‹دختر خنده‌رویی بود: کچێکی خەنەران بوو›.

**خنده‌زنان** / xandezanān/: *قید.* بە پێکەنینەوە؛ بە قاقا لێدان؛ بە تریقانەوە؛ بە حیلکانەوە ‹خنده‌زنان از او دور شدم: بە پێکەنینەوە لێی دوور کەوتمەوە›.

**خنده‌کنان** / xandekonān/: *قید.* بە پێکەنینەوە؛ بە خوایوە؛ لە حاڵی پێکەنیندا ‹خنده‌کنان سیبی برداشتم و به سویش انداختم: بە پێکەنینەوە سێوێکم هەڵگرت و بۆم هاویشت›.

**خندیدن** / xandîdan/: *مصدر. لازم. متعدی.* //**خندیدی:** پێکەنیت؛ **می‌خندی:** پێدەکەنی؛ **بخند:** پێبکەنە// پێکەنین؛ کەنین؛ خەنین؛ ویاتەی؛ خوەی؛ خوای؛ خەنس؛ هوایش؛ هواتەیش؛ هوواتش؛ ویەیش؛ ویایش: ◻*لازم.* ۱. شادی خۆ بە خەندە دەربڕین ‹همه می‌گفتند و می‌خندیدند: هەمووان قسەیان دەکرد و پێدەکەنین› ۲. بە شێوەیێکی شاد و گەش ڕابواردن‹آن شب چقدر خندیدیم: ئەو شەوە چەندە پێکەنین› ◻*متعدی.* ۳. شۆخی پێکردن؛ گاڵتە پێکردن؛ گەمە پێکردن ‹اگر این حرف را بزنی، همه به تو می‌خندند: ئەگەر ئەم قسە بکەی هەموو پێت پێدەکەنن›.

هەروەها: **خندیدنی**

■ صفت مفعولی: **خندیده** (پێکەنیو)/ مصدر منفی: **نخندیدن** (پێنەکەنین)

**خنزرپنزر** / xenzerpenzer/: *اسم.[گفتاری]* شڕ و شیتاڵ؛ شڕە و بڕە؛ شڕە و مڕە؛ شڕ و تاڵ؛ شنگرشیواڵ؛ پت و پیارسک؛ شەخەڵ مەخەڵ؛ وردە و پردە؛ شتی جۆراوجۆری کۆن، شکاو، لەکارکەوتوو یان دڕاو ‹این خنزرپنزر را بریز دور و خودت را راحت کن: ئەم شڕ و شیتاڵە فڕێ دە و خۆت خەلاس کە›.

**خنزرپنزری** / xenzerpenzerî/: *اسم.[گفتاری]* کۆنەفرۆش؛ کۆنەسێن؛ هۆردەفرۆش؛

وردەوالەفرۆش؛ کەسێ کە شڕ و شیتاڵ خڕ دەکاتەوە، یا دەیکڕێ و دەیفرۆشێ ‹یک پیرمرد خنزرپنزری هر روز توی کوچەی ما پیدایش می‌شد: پیرەپیاوێکی کوسەفرۆش هەموو ڕۆژێک لە کۆلانەکەی ئێمەدا دەردەکەوت›.

**خنس‌وفنس** / xenes-o-fenes/: *اسم. [گفتاری]* هەژاری؛ نەداری؛ فەقیری؛ دەسکورتی؛ پیسی؛ نچاری: **خنسی**

◘ **به خنس‌وفنس افتادن:** کەوتنە پیسیەوە؛ کەوتنە سەر ساجی عەلی؛ کەوتنە ترەترەوە؛ کەفتنە تاقەوگوو؛ بێپارە بوون و بۆ ژیان دامان ‹آخرهای ماه پولم تمام شد و به خنس و فنس افتادم: ئاخرەکانی مانگ، پارەم پێ نەما و کەوتمە پیسیەوە›.

**خنسی** / xenesî/ ☜ **خِنِس‌وفِنِس**

**خنصر** / xenser/: [عربی] *اسم. [ادبی]* تووتە؛ گولاتی؛ گولێ؛ گیشا قلینج؛ تبلیا بیچک؛ قامکەتووتە؛ قلیچان؛ قامکەچکۆلە؛ تبلاگچکە؛ قامکە چکۆلەی دەست.

**خنک** / xonak/: *صفت.* ۱. فێنک؛ هێنک؛ هوونیک؛ هۆنک؛ چایگ؛ چێییگ؛ هوینک؛ هین؛ هوونک؛ فوونک؛ چیا؛ چیاو؛ سارد؛ چیاگ؛ ساردێکی خۆش ‹هوای خنک: کەشی فینک› ۲. *[مجازی]* (لەمەڕ کار یان کردەوەیەکی نابار و ناخۆش) سار؛ سارد؛ بێتام؛ بێمەک ‹شوخی خنک: گاڵتەی سار›.

**خنکا** / xonakā/: *اسم.* فێنکایی؛ چۆنیەتی فێنک بوون ‹خنکای شب: فێنکایی شەو›.

**خنکی** / xonakî/: *اسم. [گفتاری]* ۱. فێنکی؛ فێنکایی؛ فوونکی؛ فێنکایەتی؛ هوونکایی؛ هێنکایی؛ هوونیکایی ۲. ساری؛ هەرکام لەو خواردەمەنیانەی کە خواردنیان ئەبێتە هۆی فێنک بوونەوە یان لاچوونی هەستی گەرما.

**خنگ**[1] / xeng، ـها/: *اسم. [ادبی]* ئەسپی سپی؛ ئەسپی چەرمگ؛ ئەسپی چەرموو.

**خنگ**[2] / ـها/: *صفت. [گفتاری]* حۆل؛ گەلحۆ؛ گەوج؛ گێژ؛ گێج؛ خول؛ دەبەنگ؛ گێل؛ هێڕ؛ خاوەن بەهرەی هۆشی کەم کە واتای ڕووداوی دەور و بەری خۆی ئاستەم یان خراپ تێبگا ‹چقدر خنگ بود، اصلاً چیزی نمی‌فهمید!: چەندە حۆل بوو، هیچی نەدەفامی!›. هەروەها: **خنگ بودن؛ خنگ شدن**

◘ **خنگ خدا:** حەپەحۆل؛ گێژوڵلا؛ لاژگ؛ حۆل لە دایک بوو ‹آخر خنگ خدا، مگر عقلت نمی‌رسد؟: ئاخر حەپەحۆل، مەگەر عەقڵت پێ ناشکێ؟›.

**خنگی** / xengî/: *اسم.* گێژی؛ خولی؛ حۆلی؛ گێجی؛ گەوجی؛ لاژگی؛ بار یان چۆنیەتی گێژ بوون ‹آدم به این خنگی دیده بودی؟: مرۆی بەم گێژیەت دیتبوو؟›.

**خنیاگر** / xonyāgar، ـها؛ ـان/: *اسم. [ادبی]* هۆنیاوان؛ دەلوو؛ بەزمگێڕ؛ گۆبەندگێڕ؛ شایەر؛ کەسێ کە هەم ساز لێدەدا و هەم دەخوێنێ. هەروەها: **خنیاگری**

**خو** / xû/: *اسم.* خوو؛ هوو؛ خدە؛ خەدە؛ نەریت؛ شێوەی هەڵس‌وکەوتی ئاسایی و هەمیشەیی گیاندارێک کە تایبەتی خۆیە و لە درێژایی ژیاندا پێی ڕادێ: **خوی** *[ادبی]*

◘ **خو کردن:** خووگرتن؛ خوو پێ گرتن؛ عادەت‌کردن؛ هوکارە بوون. هەروەها: **خو گرفتن**

**خواب**[1] / xāb/: *اسم.* ۱. خەو؛ خوو؛ خاو؛ خەون؛ خەڤ؛ نڤ؛ خەف؛ هووت؛ هووتە؛ دۆخی حەسانەوەی گیاندار کە لەو حاڵەدا چالاکی لەشی و دەماری دەشکێتەوە و هەستی گیانەوەر لە بەرانبەر بزوێنەری دەرەکیدا کەم دەبێتەوە ‹خواب بودن: لە خەودا بوون› ۲. /ـها/ خەون؛ خەو؛ وەرم؛ هورم؛ هەون؛ هۆن؛ ئەوەی لەو کاتەدا لە مێشکی گیاندار بەدی دێ ‹خواب دیدن: خەو دیتن› ۳. *[مجازی]* بار؛ خەو؛ لایەنێک کە بەن، موو، خوری و... دەکەنە سەریەک

‹قالی را از طرف خوابش جارو کن!: مافوورەکە لە باریدا گەسک لێبدە›.

▣ **خواب ابدی:** *[کنایی]* خەوی یەکجاری؛ خەونی هەتایی؛ خەوی ئاخری؛ مەرگ ‹بە خواب ابدی فرو رفت: چووە خەوی یەکجارییەوە›.

**خواب اصحاب کهف:** *[کنایی]* خەوی ئەسحابی کەهف؛ خەوی زۆر قورس و درێژخایەن.

**خواب خرگوشی:** ١. کەروێشکەخەو؛ خەوی بە چاوی نەبەسراو ٢. *[مجازی]* بێخەبەری.

**خواب زمستانی:** *[زیست‌شناسی]* زستانە خەو؛ جستانە خەو؛ خەوی زستانی؛ دۆخی کەم بوونەوەی بە گوژمی چالاکی ژیان لە زۆرێک گیا و گیانەوەردا کە بە هۆی داشکانی دەمای هەوا لە وەرزی زستاندا ڕوو دەدات.

**خواب سبک:** خەوی سووک؛ سەرخەو؛ سووکەخەو؛ هەونی سڤک؛ گورگەخەو؛ خەوێ سووک کە زۆر بە هاسانی لە سەر بپەڕێ.

**خواب سنگین:** خەوی قورس؛ خەوی گران؛ خەوێ کە خەوتوو بە هاسانی خەبەری نەبێتەوە.

**خواب گران:** *[ادبی]* ١. خەوی قورس؛ خەوی گران ٢. *[کنایی]* بێخەبەری یەکجاری.

**خواب مصنوعی:** خەوی دەسکرد؛ خەوبردنەوە بە هیپنۆتیزم.

▣ **خواب از سر / چشم کسی پریدن:** خەوی کەسێ زڕان؛ خەو لە کەسێ ڕەوینەوە؛ خەو پەڕین؛ نەمانی خەواڵوویی؛ هەون ڕەمیایش؛ وەرموو یۆی ڕەمەی/ پڕەی ‹دیگر خواب از سرم پرید و نمی‌توانم بخوابم: ئیتر خەوم زڕا و ناتوانم بنوومەوە›.

**خواب آمدن:** خەو هاتن؛ وەرم ئامەی؛ دەرکەوتنی نیشانەکانی خەو ‹خوابم می‌آید: خەوم دێ›.

**خواب آوردن:** خەو هێنان؛ وەرم ئاردەی؛ باری خەو داهێنان ‹ماست خواب می‌آورد: ماس خەو دێنێ›.

**خواب بردن:** خەو لێکەوتن؛ خەو پیاکەوتن؛ خەو بردنەوە؛ وەرم پۆڕەکەوتەی ‹روی صندلی خوابم برد: لە سەر سەندەڵییەکەوە خەوم لێ کەوت›.

**خواب بودن:** خەوتوو بوون؛ لە خەودا بوون؛ وەرمەنە بیەی ‹وقتی آمدم تو خواب بودی: کاتێ هاتم تۆ لە خەوتبووی›.

**خواب به چشم کسی نرفتن / نیامدن:** چاوی کەسێ نەچوونە خەو؛ خەو لە کەسێنەکەوتن؛ خەو نەهاتن؛ وەرم نەکەوتەی پۆڕە؛ وەنەوز نەدەی ‹تا صبح خواب به چشمم نرفت: تا بەیانی چاوم نەچووە خەو›.

**خواب دیدن:** خەون دیتن؛ خەو دیتن؛ خەون بینین: ١. وەرم دیەی؛ وەرم وینەی؛ هەون ڤیانایش؛ هەون دەییش؛ دیتنی شتانێک لە خەودا ‹خواب دیدم رفتم به ماه: خەونم بینی چووم بۆ مانگ› ٢. *[مجازی]* بە هزرەوە چوون؛ لێتێک چوون و کەوتنە گومانەوە ‹همچو چیزی نیست، خواب دیدی خیر باشد: شتی وا نیە، خەوت دیوە خەیر بێ› ٣. *[تعریض]* تەون نانەوە؛ خەون بۆ شتێ دیتن؛ بۆ کەسێ یان شتێک پیلان گێڕان ‹برای پولهای پدرش خوابی دیده بود: خەوی بۆ پووڵ و پارەی بابی دیبوو›.

**خواب رفتن:** ١. سڕ بوون؛ تەزین؛ لە جووڵە کەوتن یان تەزوو پێدا هاتنی دەست یان لاق بەهۆی نەبزووتنەوە یان ماندوویی زۆرەوە ‹پاهام خواب رفته: هەردوو لاقم سڕ بووە› ٢. ☜ **به خواب رفتن**

**خواب کردن:** کردنە خەو؛ دەخەوکردن؛ نڤاندن؛ خەواندن؛ خەفاندن؛ وسنای؛ نوانن ‹اول همه را خواب می‌کند بعد خودش می‌خوابد: لە پێشدا هەمووان دەکانە خەو، پاشان بۆ خۆی دەخەوێ›.

خواب کسی تعبیر شدن: *[مجازی]* خەوی کەسێ هاتنە دی؛ دروست خوێندنەوە؛ لە خاڵ دان ‹سرانجام خواب تعبیر شد و فلانی مرد: ئاخری خەوەکەی هەڵدی و کابرا مرد›.

خواب کسی ریختن: *[مجازی]* خەو شکانە چاو کەسێک؛ زۆر ئاتاجی نووستن و لە خەو رانەچوون.

خواب گرفتن: خەو داگرتن؛ خەو بردنەوە؛ وەرم پەیئامەی؛ خەو زۆر بۆ هێنان ‹خوابم گرفت و دست از کار کشید: خەو دایگرت، دەستی لە کار کێشا›.

خواب ماندن: دەخەو ڕاچوون؛ خەبەر نەبوونەوە؛ بە خەبەر نەهاتنەوە؛ خەو بردنەوە؛ درەنگتر لە کاتی پێویست بەیار بوونەوە ‹ساعت خوابیده بود، صبح خواب ماندم و دیر به مدرسه رسیدم: سەعاتەکە خەوتبوو، بەیانی دەخەو ڕاچووم و دێر گەیشتمە فێرگە›.

خواب هفت پادشاه را دیدن: *[کنایی]* لە حەوت ساڵان ڕاست بوونەوە؛ پرخە لێ هەستان؛ چوونە خەوی قورس و درێژخایەنەوە.

از خواب پا شدن: لە خەو هەستان؛ لە خەو خەبەر بوونەوە؛ لە خەو ڕابوون؛ وەرمەنە هۆرسەی ‹نصف شب از خواب پا شدم: نیوە شەو لە خەو هەستام›.

از خواب پریدن: لە خەو ڕاچڵەکان؛ داچڵەکان لە خەو؛ وەرمەنە چڵەکیایرە؛ لە پڕا و بەهۆی کارەساتێکەوە لە خەو هەستان ‹با صدای تلفن از خواب پرید: بە زرەی تەلەفوون لە خەو ڕاچڵەکا›.

به / در خواب دیدن: لە خەودا بینین: ۱. خەو پێوە دیتن؛ وەرمەنە دیەی؛ کەسێک یان شتێک لە خەودا هاتنە بەر چاو ‹دیشب مادرم را در خواب دیدم: دوێشەو دایکمم لە خەودا بینی› ۲. *[مجازی]* بە خەو بینین؛ وەرمەنە وینەی؛ دەست نەگەیشتن بە شتێک ‹مگر عروسی با دختر من را به خواب ببینی: کچی من مەگەر بە خەو ببینی›.

به خواب رفتن: چوونە خەو؛ دەخەو ڕاچوون؛ هەون بەبیش؛ هەون دەییش؛ خەو لێکەوتن؛ وەرم پۆرەکەوتەی؛ وتەی ‹سرانجام به خواب رفت: ئاخری چووە خەو›: **خواب رفتن** *[گفتاری]*

به خواب کسی آمدن: چوونە خەوی کەسێکەوە؛ هاتنە خەو کەسێک؛ ئەنە وەرمەوو یۆی ئامەی ‹دیشب مادرم به خوابم آمده بود: دوێشەو دایکم هاتبووە خەوم›.

در خواب بودن: لە خەودا بوون؛ خەفتگ بوون؛ وەرمەنە بیەی ‹ساعت ۱۰ هنوز در خواب بود: سەعات ۱۰ هێشتا لە خەودا بوو›.

**خواب**[2]: *صفت.[کنایی]* خەوتوو؛ چاوبەسراو؛ بێخەبەر؛ بێهۆش ‹تو هنوز خواب هستی و این حرفها را نمیفهمی: تۆ هێشتا خەوتووی و ئەم قسانە نافامی›.

**ـ خواب**[3]: *پیواژه.* ـ خەو؛ ـ خەف؛ ـ هەون: ۱. ـ وەرم؛ ئەوەی کە ئەخەوێ ‹بدخواب: بەدخەو› ۲. ـ بووس؛ شیاو یان لەبەرچاوگیراو بۆ خەوتن ‹تختخواب: تەختیخەو›.

**خواب آلود** / xābālûd/: *صفت.* خەواڵوو؛ خەواڵۆ؛ خاواڵی؛ خۆواڵی؛ خاواڵین؛ خەواوی؛ وەرمین؛ وەرمئاشتین؛ بێداری هێشتا چاو بەخەو ‹صدایش خوابآلود بود: دەنگی خەواڵوو بوو›.

**خواب آلودگی** / xābālûdegî/: *اسم.* خەواڵوویی؛ خەواڵۆیی؛ وەرمئاشتینی؛ بار یان چۆنیەتی خەواڵۆ بوون.

**خواباندن** / xābāndan/: *مصدر. متعدی.* //**خواباندی**: خەواندت؛ **میخوابانی**: دەخەوێنی؛ **بخوابان**: بخەوێنە// خەواندن؛ خەفاندن: ۱. دەخەوکردن؛ نڤاندن؛ نڤستاندن؛ ڕازاندن؛ نواندن؛ وسنەی؛ وسنای ‹بچه را خواباندن: منداڵ خەواندن› ۲. بەستەری کردن لە نەخۆشخانەدا ‹در بیمارستان خواباندن: لە نەخۆشخانەدا خەواندن›

۳. هێدی کردن؛ ئارام کردن؛ دامرکاندن؛ داسەکناندن؛ داتەمراندن؛ هەداندن؛ لە گوژمەی شتێ کەم کردنەوە ‹سر و صدا را خواباندن: هەرا و هووریا خەواندن› ٤. دانەواندن؛ چەماندنەوە؛ لە باری ڕاوەستاوی یان قنجی ترازاندن ‹لبەی کلاه را خواباندن: قەراغی کلاو خەواندن› ٥. بۆ هەڵگرتن، گۆڕانی شێواز، ڕەنگ کردن یان بۆدان خستنە ناو تراوێکەوە ‹در سرکه خواباندن: لە سرکەدا خەواندن› ٦. دەس پێ‌هەڵگرتن یان وێساندنی کارێ ‹کار را خواباندن: کار خەواندن› ۷. *[گفتاری]* لێدان؛ سرەواندن؛ کوتان؛ وسنەی (بەتایبەت زلله) ‹بیخ گوش کسی خواباندن: خەواندنە لاملی کەسێکەوە› ۸. ڕازاندن؛ ڕاکشاندن؛ هەلاژنین؛ هەلاژاندن؛ وسنەی؛ ئیژنایرە؛ ئەرەئیژنەی؛ کەسێ بە باری ئاسۆیی و بە سەر ڕوویەکدا ڕێک کردن ‹روی تخت خواباندن: لە سەر تەخت خەواندن› ۹. *[کشاورزی]* کەوشەک دان؛ شێوەکارێ بۆ زۆر کردنی برێ دار بە کردنە ژێر خاکی لق‌وپۆە نزیکەکانی لە زەوی تا ڕەگ دابکوتێ و وەک دارێکی جیا و سەربەخۆ دەربێ: **خوابانیدن**. هەروەها: **خواباندنی**

■ صفت فاعلی: **خواباننده** (خەوێنەر)/ صفت مفعولی: **خوابانده** (خەوێنراو)/ مصدرمنفی: **نخواباندن** (نەخەواندن)

**خوابانیدن** / xābānîdan/ ☜ **خواباندن**

**خواب‌آور** / xābāvar ، ـها/: *صفت.* خەوهێنەر؛ خەوێنەر؛ بە تایبەتمەندی یا توانستی خەو هێنان.

**خواب‌زدا** / xābzedā ، ـها/: *صفت.* خەوڕەوێن؛ خەوپەڕێن؛ خەوزڕێن؛ بە تایبەتمەندی یان توانای لەناو بردنی خەواڵویی یان هەستی نیاز بە خەو.

**خوابگاه** / xābgāh ، ـها/: *اسم.* حەوانگە؛ خەوتنگە؛ نووستنگە: ۱. خەوگا؛ خەفگە؛ وەتاغی تایبەتی خەو، بەتایبەت لە دامەزراوەیەکی هەمووانیدا (وەکوو قوتابخانەی شەوانەڕۆژی یان پەروەرشتگا) ۲. خانووبەرەیەکی تایبەت بۆ حەسانەوە و شەو مانەوەی کەسانی سەر بە دامەزراوە یان دەستەیەک ‹خوابگاه دانشجویان: نووستنگەی خوێندکاران›.

**خوابگردی** / xābgardî/: *اسم.* خەوگەڕی؛ نەخونجاویەک لە خەوتنی برێ کەس کە دەبێتە هۆی ڕێگە چوونی لە خەودا. هەروەها: **خوابگرد**

**خوابگزار** / xābgozār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* خەولێکدەر؛ خەوڤەهێن؛ کەسێ کە گوایە لە گوێدان بە ڕازەی ئەوەی کە دیتران لە خەودا دیتوویانە، ڕووداوەکانی داهاتوو دەڵێتەوە. هەروەها: **خوابگزاری**

**خواب‌گفتاری** / xābgoftārî/: *اسم.* کار یان دیاردەی ڕاواندن؛ وڕاوەکردن؛ وڕێنەکردن؛ ڕاوەی؛ کردەوە یان دیاردەی قسەکردن لە خەودا. هەروها: **خواب‌گفتار**

**خوابنامه** / xābnāme ، ـها/: *اسم.* خەونامە؛ کتێبێک کە واتای خەوی تێدا نووسراوە.

**خواب‌نما** / xābnemā/: *اسم.* کەسێ کە داهاتوو بە خەو دەبینێ یان بە خەو لە ڕوودانی کارەساتێک خەبەردار ئەبێ.

**خواب‌وبیدار** / xāb-o-bîdār/: *صفت.* ۱. خەوێڕ؛ خەو و بێگار؛ خەفتە و وریا ۲. *[نساجی]* دووبار؛ دووبەرەک؛ بە پرز و ڕیشاڵگەلی لە هەر دوو لاوە.

**خواب‌وخیال** / xāb-o-xiyāl/: [فارسی/ عربی] *صفت. [مجازی]* خەیاڵ‌پلاو؛ خەو و خەیاڵ؛ خەو و خەیاڵ؛ دوور لە ڕاستی ‹اینکه خانه ارزان می‌شود، خواب و خیال است: ئەمەی کە ماڵ هەرزان دەبێ، خەیاڵ‌پلاوە›.

**ـ خوابه** / xābe ، ـها/: *پیوازه. [گفتاری]* ـــ خەوە؛ خاوەن دیوی خەوتن ‹آپارتمان دوخوابه: وارخانی

دووخەوە›.

**خوابیدن** / xābîdan/: مصدر. لازم. // **خوابیدی:** خەوتی؛ **می‌خوابی:** دەخەوی؛ **بِخواب:** بخەوە// خەوتن؛ خەوچین؛ خەفتن؛ نووستن؛ نڤستن؛ نڤان؛ وتەی؛ هۆتەی؛ وتش؛ هەونا؛ هاون؛ هەڤتن؛ هەفتن؛ هۆیتن؛ نشتش: ١. چوونە خەو؛ خەو بردنەوە؛ وەرم کەوتەی پۆرە ‹لالایی گفتم، خوابید: لایە‌ـلایەم وت، خەوت› ٢. بەستەری بوون ‹ده روز تو بیمارستان خوابید: دە ڕۆژ لە نەخۆشخانەدا خەوت› ٣. چالاکی یان جم و جووڵ نەمان ‹کار خوابیدن: کار خەوتن› ٤. دامرکان؛ هەدران؛ ئەرەوتەی؛ کەم بوونەوەی توندی ‹سر و صدا خوابید: دەنگ و هەرا خەوت› ٥. نیشتنەوە؛ سافبوون؛ لە دەرپەڕیوی و چرچ و لۆچی دەرهاتن‹اتویش کن تا چینهایش بخوابد: ئوتووی کە، با چرچەکانی بخەوی› ٦. *[کنایی]* بێخەوەر بوون؛ بێ‌ئاگا بوون ‹تو خوابیدی، از جایی خبر نداری: تۆ خەوتووی، لە هیچ کوێ ئاگات نیە› ٧. ڕاکشان؛ ڕازان؛ ڕاژان؛ ڕازین؛ هەلاژیان؛ ئەرەئیژیای؛ ئیژیەیرە؛ کیشیایرە؛ لەش لە باری ئاسۆییدا دانان ‹روی تخت خوابیدن: لە سەر تەختەوە خەوتن› ٨. *[کنایی]* هاوجێ بوون؛ سەرجێی کردن؛ تێکەڵ بوون لەگەڵ کەسێکدا ‹خدا می‌داند با چند نفر خوابیده: خوا ئەزانێ لەگەڵ چەند کەسدا خەوتووە›. هەروەها: **خوابیدنی**

■ صفت مفعولی: **خوابیده** (خەوتوو)/ مصدر منفی: **نَخوابیدن** (نەخەوتن)

**خوابیده**[1] / xābîde/: صفت. خەوتوو؛ خەفتگ؛ نووستوو؛ ڕازایی؛ هەفتۆ؛ خەوتو؛ خەولێ‌کەوتوو؛ نووستی؛ نڤستی؛ نوستو؛ هەفتە؛ نڤت؛ نڤستی

**خوابیده**[2]: قید. بەڕاکشاوی؛ ڕاژاو؛ ڕازاو؛ هەلاژیاو؛ ئیژیا؛ درێژەو بووگ؛ پاڵکەوتوو؛ پاڵکەفتگ؛ تەپیا؛ بە ڕاکشاوی‹خوابیده درس می‌خوانی؟!: بەڕاکشاوی وانە دەخوێنی؟!›.

⊡ **خوابیده پارس کردن:** *[تعریض]* زەڕین و نەپەڕین؛ وەک کەری عوزەیر سەڕینی هەببوون و پەڕینی نەبوون؛ لە دەما هار و لە قەلبا بیمار بوون؛ بە قسە ئالی زەنگان و بە کردە ڕیخ لە لنگان بوون؛ هاش و هووش کردن ‹اهمیت نده، خوابیده پارس می‌کند!: گوێ مەدەیە، دەزەڕێ، ناپەڕێ!›.

**خواجگی** / xācegî/: اسم. ١. ساپوورەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ساپوورە بوون ٢. *[ادبی]* سانی؛ خانی؛ ئاغایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سان بوون.

**خواجه** / xāce ، ـها؛ ـگان/: اسم. ١. ساپوورە؛ نێرەمووک؛ نە نێر نە مێ؛ مێردێ کە سەرجێیی لێ نایە (وەک کەسێ کە خەسراوە) ٢. *[قدیمی]* پیر؛ بابا؛ سەرناوێکی بەڕێزانە بۆ پیاوان ‹خواجه‌حافظ: پیرحافز› ٣. *[ادبی]* سان؛ خان؛ ئاغا؛ ئەرباو؛ ئەرباب؛ خودان؛ مەزن؛ سەروەر؛ زەنگین؛ بەگ؛ دەوڵەمەند ٤. خاوەن؛ خودان؛ ساحێو.

**خواجه‌سرا** / xācesarā ، ـها؛ ـیان/: اسم. *[قدیمی]* خواجەسەرا؛ ساپوورەیەک کە لە ماڵی شایان و گەورەپیاواندا خزمەتی دەکرد.

**خوار**[1] / xār/: صفت. سووک: ١. خار؛ زەبوون؛ هوودار؛ پەست؛ بێڕێز و بایەخ لە چاو کەسانی دیکەدا ٢. *[قدیمی]* هاسان؛ سانا ‹کار پسران خوارتر است: کاری کوڕان هاسانترە›.

⊡ **خوار شمردن:** بە سووک زانین؛ بایەخ پێ‌نەدان؛ بە کەم زانین؛ بە هیچ دانان ‹کس را نباید خوار بشمری، چرا که هر کس توانایی‌هایی دارد: نابێ کەس بە سووک بزانی، چونکە هەرکەسێک لێهاتوویگەلێکی هەیە›.

**خوار کردن:** سووک‌کردن؛ بێ‌بایەخ کردن ‹با رفتار و گفتارش خود را در چشم دیگران خوار می‌کرد: بە کردار و گوتاری، خۆی لە چاوی کەسانی دیکەدا سووک دەکرد›. هەروەها: **خوار بودن؛ خوار شدن**

**ـ خوار**[2]: پیوازه. ـخۆر؛ ـوەر؛ ـخار؛ بخۆر ‹گوشتخوار: گۆشتخۆر›.

**خواربار** / xār(o)bār/: اسم. بژیو؛ تفاق؛ زاد و زەوات؛ کەرەسەی سەرەتایی خۆراکی ڕۆژانەی مرۆڤ.

**خواربارفروش** / xār(o)bārfurûš ، ـها؛ ـان/: اسم. بەقاڵ؛ کەسێ کە پێداویستی خواردەمەنی ڕۆژانەی خەڵکی (وەک برنج، دانەوێڵە، ڕۆن، قەن و چای و...) دەفرۆشێ. هەروەها: **خواربارفروشی**

**خوارج** / xavārec/: [عربی] جمعِ ☜ **خارجی**

**خواری**[1] / xārî ، ـها/: اسم. سووکی؛ پەستی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بێبایەخ بوون یان کەوتنە بەر سووکایەتیەوە ‹بیچارە از تبار روستایی خود، احساس خواری می‌کرد، اما حماقتش موجب خواری او بود: داماو لە لادێیی بوونی خۆی، هەستی بە سووکی دەکرد، کەچی گێل بوونی هۆی سووکی ئەو بوو›.

**ـخواری**[2]: *پیواژه.* ـ خۆری؛ ـ وەری؛ ـ خاری؛ خواردن ‹خامخواری: کاڵخوری›.

**خواست**[1] / xāst ، ـها/: اسم. ویست؛ خواز؛ داخواز؛ داخوازی؛ داوخوازی؛ هاس؛ واز؛ خواست؛ نیاز؛ داوا؛ داواکاری ‹خواست شما چیست؟ به طور دقیق بیان کنید: ویستی ئێوە چیە؟ بە وردی بیلێن›.

**ـ خواست**[2] / ـها/: *پیواژه.* ـخواست؛ ـواس؛ ـهاس؛ ـ ویس؛ ـ ویست: ١. خوازەر؛ خوازگار؛ خوازیار؛ داخواز؛ داخوازکار؛ ویستیار ‹دادخواست: دادخواز› ٢. ویستن؛ خواستن؛ داخوازی‌کردن ‹بازخواست: بازخواست›.

**خواستار** / xāstār ، ـان/: *صفت.* خوازیار؛ خوازەر؛ داخوازیکەر؛ خوازگار؛ داواکەر؛ هەرەکەر؛ ئارەزووکەر ‹آنان آزادی زندانیان را خواستار شدند: ئەوان خوازیاری ئازادی بەندیەکان بوون›. هەروەها: **خواستار بودن؛ خواستار شدن**

**خواست‌اندیشی** / xāstandîšî/: اسم. کار یان ڕەوتی تێڕوانین و بیر کردنەوە بە پێی ویست و ئارەزووی خۆ بە بێ‌ئاوڕدانەوە لە ڕاستی و پێویستی و بار و دۆخی دەرەوە.

**خواست‌برگ** / xāstbarg/ ☜ **احضارنامه**

**خواستگار** / xāstegār ، ـها؛ ـان/: اسم. داواکار: ١. خوازبێنیکەر؛ خوازمەن؛ خواستمەنیکەر؛ خۆستی؛ داوان؛ داوخواز؛ خۆهەستی؛ هەیجوو؛ هێجبی؛ هیجووی؛ هێجیکار؛ داواکەر؛ ئەوەی خوازیاری کچ یان ژنێکە (بۆ خۆی یا کەسێکی دی) ‹برای سارا خواستگار آمده بود: بۆ سارا داوەکەر هاتبوو› ٢. *[نامتداول]* خوازگار؛ خوازیار؛ کەسێ کە شتێکی ئەوێ.

**خواستگاری** / xāst(e)gārî ، ـها/: اسم. خوازبێنی؛ خوازگینی؛ خوازگێنی؛ خوازگاری: ١. وازبێنی؛ خوازمەنی؛ داوخوازی؛ هێجبی؛ هێجوی؛ هەیجووی؛ داواکاری لە کچ یان ژن بۆ ژیانی هاوبەشی ‹در اینجا رسم نیست دختر از پسر خواستگاری کند: لێرەدا باو نیە کچ لە کوڕ خوازبێنی بکا› ٢. ڕێوڕەسمی تایبەتی هێجووی‌کردن (وەکوو ڕۆیشتن بۆ ماڵی کچی دیاریکراو و وتوویژ دەگەڵ بنەماڵەیدا) ‹امشب به خواستگاری سارا دعوتم: ئەمشۆ بۆ خوازبێنی سارا دەنگ کراوم›. هەروەها: **خواستگاری کردن؛ به خواستگاری رفتن**

**خواستن** / xāstan/: مصدر. متعدی. لازم. // **خواستی:** ویستت؛ **می‌خواهی:** دەتەوێ؛ **بخواه:** بتەوێ // ویستن؛ خواستن؛ خواسن؛ خوازتن؛ تواسن؛ هواسن؛ گستن؛ خۆهستن؛ واستەی؛ واسەی؛ واستش؛ واستە: □ *متعدی.* ١. بانگ کردنی کەسێ؛ هەرا کردن ‹آزاد را خواسته بودند: ئازادیان ویستبوو› ٢. حەز لێکردن؛ حەز پێکردن؛ گەرەک بوون؛ توان؛ وەش سیای ‹پسرش او را خیلی می‌خواست: کوڕەکەی ئەوی زۆر دەویست› ٣. داوا کردن؛ نیازی خۆ دەربڕین ‹آب خواستن: ئاو ویستن› ٤. پێویست بوون؛ گەرەک بوون؛ نیازمەند بوون ‹این کار دو ماه وقت می‌خواهد: ئەم کارە دوو مانگی دەوێ› ٥. لێ داواکار بوون؛ لێ‌گەرەک بوون ‹دو ماه بود که از من صد تومان می‌خواست: دوو مانگ بوو، سەد تمەنی لە من

دەویست› ◻لازم. ٦. توان؛ ئەتوان؛ گەرەک بوون؛ نیاز بوون؛ ئاهەنگ بوون ‹خواستم بگویم، نشد: دەمەویست بلێم، نەکرا› ٧. *[دستور]* کاری هاوکار بۆ کاتی داهاتوو ‹خواهم رفت: دەچم›.

هەروەها: **خواستنی**

■ صفت فاعلی: **خواهنده** (ـــ)/ صفت مفعولی: **خواسته** (خوازراو)/ مصدر منفی: **نَخواستن** (نەخوازتن)

**خواسته** / xāste ، ـها/:/*اسم*. ویست: ١. داوا؛ داواکاری؛ خوازراو؛ خوازیاگ؛ ویستراو؛ تخوون خواستە؛ ئەوی کە کەس یان دەستەیەک خوازیارین ‹خواستەی خود را بەدست آوردند: ویستی خۆیان بەدەس هێنا› ٢. *[حقوق]* خوازراوی؛ ئەوەی سکالابەر لە دادنامەیدا خوازیاریەتی ٣. *[ادبی]* ماڵ و سامان؛ دارایی.

**خواص** / xavās(s)/: [عربی]/*اسم*. ١. بلیمەتان؛ هەڵکەوتوان؛ کەسانی هەڵبژاردە و هەڵکەوتوو. بەرانبەر: **عَوام** ٢. جمعِ ☜ **خاصه** ٣. جمعِ ☜ **خاصیت**

**خوان**[1] / xān ، ـها/:/*اسم*. خوان: ١. خوانچە ٢. *[ادبی]* سفرە.

**ـخوان**[2] / ـها/: *پیواژه*. ـخوێن؛ ـخوان؛ ـوان؛ ـوەن؛ ـخۆن؛ ـخوەن؛ ـچڕ؛ خوێنەر ‹درس‌خوان؛ کتاب‌خوان: وانەخوێن؛ کتێب‌وان›.

**خوانا** / xānā/: *صفت*. وانا؛ لەباوی خوێندنەوە بە هاسانی ‹خط خوانا: خەتی وانا›.

**خوانائی** / xānā'î/ ☜ **خوانایی**

**خوانایی** / xānāyî/:/*اسم*. وانایی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی وانا بوون: **خوانائی**

**خوانچه** / xānče ، ـها/:/*اسم*. خوانچە: ١. سینی گەورەی چێوی چەند ڕەنگە بۆ شت لە سەر نان و بە دیاری بردن ٢. ئەو شتانەی کە لە سەر خوانچەوە ئەبرێت ‹خوانچەی عروس: خوانچەی بووک› ✻ **خُنچه؛ خُونچه**

**خواندن** / xāndan/: مصدر. متعدی. لازم. // **خواندی**: خوێندت؛ **می‌خوانی**: دەخوێنی؛ **بِخوان**: بخوێنە// ◻ *متعدی*. ١. خوێندن؛ خواندن؛ خوەنن؛ خۆندن؛ خوێنە؛ وەندایەنە؛ وەخوێندن؛ وانایوە؛ ئەوەوانەی؛ گواستنەوەی نیشانەگەلی نووسراوەیەک بۆ مێشک و چیٚکرنی بڕگە و دەنگەکانی دەسنیشانکراو و لێکهاتوو لەتەکیاندا ‹کتاب خواندن: کتێب خوێندنەوە› ٢. خواندن؛ خوێندن؛ وانەی؛ دەربڕینی ئەو نیشانانە بە دەنگی بەرز؛ وانایوە؛ ڤەهاندن ‹نامە را برای ما هم بخوان: نامەکە بۆ ئێمەش بخوێنەوە› ٣. خوێندن؛ خواندن؛ وانەی؛ گوتنەوەی شیعر و ڕستە بە ئاهەنگەوە ‹آواز خواندن: ئاواز خوێندن› ٤. وانای؛ وەنتەی؛ فێر بوون ‹آزاد هنر می خواند: ئازاد هونەر دەخوێنی› ٥. *[ادبی]* بانگ‌کردن؛ گازی کرن؛ لە کەسێ ویستن تاکوو بچێتە جێیەک ‹به مهمانی خواندن: بۆ میوانی بانگ‌کردن› ٦. *[ادبی]* پێگوتن؛ ناو نانی کەسێ یان شتێ ‹شهری که مریوانش می‌خوانیم: شارێک کە مەریوانی پێ‌ئێژین› ٧. *[کنایی]* فەرمانبردن؛ وانتەی؛ وەنەی؛ وەخۆگرتن ‹کسی خطش را نمی‌خواند: کەس فەرمانی لێ نابا› ◻لازم. ٨. *[ادبی]* چواندن شبهاندن؛ بەرامبەر کردن ‹به ماه همی‌خواندن: بە مانگ چواندن› ٩.خوێندن؛ فامان؛ تێگەیشتن؛ وەنایوە؛ ئەوەزیەی ‹از قیافه‌اش خواندم که می‌خواهد چیزی بگوید: لە ڕواڵەتیدا خوێندمەوە کە دەیەوێ شتێک بڵێ› ١٠. خوێندن؛ بەیەک خواردن؛ پێک خواردن؛ وانەی ‹این رنگها با هم نمی‌خوانند: ئەم ڕەنگانە پێکەوە ناخوێنن›.

■ صفت فاعلی: **خواننده** (خوێنەر)/ صفت مفعولی: **خوانده** (خوێنراو)/ مصدر منفی: **نَخواندن** (نەخوێندن)

**خوانده**[1] / xānde ، ـها؛ ـگان/:/*اسم*.*[حقوق]* خوازراو؛ بانگ‌کراو؛ کەسێ کە لە دەستیەوە بۆ دادگا سکالا براوە.

**ـخوانده**[2] / ـها؛ ـگان/: *پیواژه*. ـپیارە؛ زڕـ ؛ پسـ ؛

هەڵەک؛ ناونراو ‹پدرخوانده: باواپیارە›.

**خواندگی** / xānandegî/: *اسم.* گۆرانی‌بێژی؛ ستران‌بێژی؛ گۆرانی‌واچی: ۱. کاری گۆرانی‌بێژ ۲. کار یان ڕەوتی گۆرانی خوێندن.

**خوانندە** / xānande ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* ۱. گۆرانی‌بێژ؛ گۆرانی‌چڕ؛ گۆرانی‌واچ؛ گۆرانی‌خوێن؛ ستران‌بێژ؛ ئاوازەخوان؛ ئاوازخوێن؛ بچڕ؛ دەنگ‌بێژ؛ قام‌بێژ؛ لاژەبێژ؛ لاوک‌بێژ؛ وەندۆخ ‹خوانندەی رادیو: گۆرانی‌بێژی ڕادیۆ› ۲. خوێنەر؛ وانەر؛ کەسێ کە نووسراوەیەک دەخوێنێتەوە ‹از خواننده می‌خواهیم کمی بلندتر کتاب را بخواند: لە خوێنەر دەخوازین هێندێک بەرزتر کتێبەکە بخوێنێتەوە›.

**ـخوانی** / xānî ، ـها/: *پیواژە.* ـخوێنی؛ خوێندن ‹آوازخوانی؛ شعرخوانی: ئاوازخوێنی؛ شیعرخوێنی›.

**خوانین** / xavānîn/: [بە قاعدەی عربی] جمعِ ☜ **خان**

**خواه**[1] / xāh/: *حرف.* چ؛ خوا؛ یەکێ لە دوو دۆخی ئەگەری (هەبوون یا نەبوون)؛ یەکێ لە دووباری لوان ‹خواه برود، خواه بماند، فرقی ندارد: چ بڕوا، چ وەمێنێ وەکوو یەک وایە›.

**ـخواه**[2]: *پیواژە.* ـخواز؛ ـواز؛ ـخاز: ۱. /ـان/ خوازەر؛ خوازگار؛ خوازیار ‹خیرخواه: خەیرخواز› ۲. دڵپەسند ‹دلخواه: دڵخواز› ۳. /ـان/ لایەنگر؛ هۆگر؛ دۆستداری شتێک ‹اسلامخواه: ئیسلامخواز›.

**خواهان**[1] / xāhān ، ـها/: *اسم. [حقوق]* خوازیار؛ کەسێ کە لە کەسێکی‌تر شکایەتی کردووە.

**خواهان**[2]: *صفت.* خوازیار؛ خوازگار؛ خوازەر؛ داواکار؛ داواکەر؛ خوازلۆک؛ خازۆک؛ خوازۆک؛ کارنیار؛ داخوازی‌کار ‹جوانان خواهان زندگی بهترند: لاوان خوازیاری ژیانێکی باشترن›.

**خواهر** / xāhar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* خوشک؛ خوێشک؛ خوەیشک؛ خوشیک؛ خوەشیک؛ خوەر؛ خوەە ؛ خوە؛ خوچ؛ خویە؛ خوار؛ خوانگ؛ خوێ؛ خە؛ خیچ؛ خێنگ؛ دەرە؛ باجی؛ ئاباجی؛ والێ؛ وا؛ وارە؛ واهەر؛ وایە؛ وایکە؛ وۆیە؛ گیانداری مێینە (بەتایبەت مرۆڤ)ی خاوەن یەک دایک و باوک (یان تەنیا باوک یان دایک) لەگەڵ کەسێکی‌تردا.

▣ **خواهر تنی:** خوشکی دایک و باوکی؛ خوشکی حەق‌وداو.

**خواهر دوقلو:** گیانەوەرێکی مێینە کە لەگەڵ گیانەوەرێکی‌تردا لە سەردەمێک و لە دایکێک بووبێ.

**خواهر دینی:** ژنی هاوکیش؛ خوشکی ئایینی؛ خوشکی دینی.

**خواهر رضاعی:** خوشکی شیری؛ خوشکی هاوشیرە؛ خوشکی هەمشیرە: **خواهر شیری**

**خواهر روحانی:** خوشکی ڕۆحانی؛ سەرناوێکی بەڕێزانە بۆ ڕەبەنان (جار و بار پلەدارانی مێینەی کلێسا): **خواهر مقدس**

**خواهر شیری** ☜ **خواهر رضاعی**

**خواهر مقدس** ☜ **خواهر روحانی**

**خواهر ناتنی:** زڕ خوشک؛ زڕ خوەه ؛ زڕ خویشک؛ خوشکی هەر لە باب یان هەر لە دایک: **ناخواهری**

**خواهرانە**[1] / xāharāne/: *صفت. [مجازی]* خوشکانە؛ یەکجار خۆشەویستانە ‹لطف خواهرانە: دلۆڤانی خوشکانە›.

**خواهرانە**[2]: *قید.* خوشکانە؛ خوەیشکانە؛ وەک خوشک و لە ڕووی خۆشەویستیەوە ‹بە همەی آنها خواهرانە خدمت کرد: بە هەموانیان خوشکانە خزمەتی کرد›.

**خواهرخواندە** / xāharxānde ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* خوشکی هەڵبژاردە؛ کچ یان ژنێک کە کەسێکی‌تر بە خۆشکی خۆی هەڵیبژاردووە.

**خواهرزادە** / xāharzāde ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* خوارزا؛ خوارزی؛ خوێشکەزا؛ خوشکەزا؛ خۆهزا؛ وارەزا؛ منداڵی خوشک؛ ڕۆڵەی خوشک؛

فرزەندی خوشک.

**خواهرزن** / xāharzan ، ـها/: اسم. ژن خوشک؛ خوشکی ژن؛ باڵتۆز؛ گۆرم؛ خوارزینە؛ خەزن؛ باتیسک؛ چەنوا؛ ژن خوویشک؛ خوشکی ژن.

**خواهرشوهر** / xāharšowhar, -šo:har ، ـها/: اسم. دش؛ دوش؛ دشە؛ وش؛ گوڵباجی؛ خانباجی؛ شوو خوشک؛ شاباجی؛ خوشکی شوو؛ خوشک شوو؛ باجی؛ گۆرم؛ خوشکی مێرد.

**خواهروار** / xāharvār/: قید. خوشکئاسا: ۱. وەکوو خوشک ۲. [مجازی] زۆر گەرم و دۆستانە.

**خواهری**[1] / xāharî/: اسم. خوشکایەتی؛ خوەیشکی: ۱. خوشکێنی؛ وایەی؛ دەستەخوشکایەتی؛ مێهرەبانی؛ دوستی یان هاودڵی لە لایەن ژن یان ژنانی کەم تا زۆر هاوتەمەنەوە ‹در حق من خواهری کرد: لە مەڕ منەوە خوشکایەتی کرد› ۲. چۆنیەتی خوشک بوون.

**خواهری**[2]: صفت. خوشکانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە خوشک ‹رابطەی خواهری: کەین و بەینی خوشکانە›.

**خواهش** / xāheš ، ـها/: اسم. خوایشت؛ خواهیش؛ هەوین: ۱. تکا؛ کار و ڕەوتی ویستنی شتێک بە شێوەیێکی ماقووڵانە ‹خواهش می‌کنم بە من کمک کنید: خوایش ئەکەم یارمەتیم بدەن› ۲. ئەوەی بەو شێوەیە خوازراوە ‹خواهش شما پذیرفته نیست: خوایشتی ئێوە وەرناگیردرێ›.

▣ **خواهش داشتن**: بە داخواز بوون؛ خواهیشت بوون؛ خوایشت هەبوون؛ خوازیاری شتێ بوون؛ تکا کردن ‹آمده بود از شما خواهشی داشت: هاتبوو لە ئێوە داخوازیکی بوو›.

**خواهشمند** / xāhešmand/: صفت. خوازمەند؛ خوازیار؛ تکاکار؛ داواکار؛ بە خواهشت ‹خواهشمندم سلام من را به ایشان برسانید: خوازمەندم سلاوی منی پێ بگەیێنن›.

▣ **خواهشمند بودن**: خوازمەند بوون؛ خوازیار بوون؛ داواکار بوون؛ هەبوونی خوایش ‹خواهشمند است جواب را هرچه سریعتر بفرستید: خوازمەندم وەلامەکە هەرچی زووتر بنێرنەوە›.

**خواه ناخواه** / xāhnāxāh/: قید. چاری ناچار؛ خوانەخوا؛ خوایی‌نەخوایی؛ بتەوێ و نەتەوێ؛ بە ناچاری؛ گەرەک ناگەرەک؛ بڤێ نەڤێ؛ خاناخا؛ گەرەکت بێ و گەرەگت نەوێ؛ لە رووی ناچاریەوە ‹خواه‌ناخواه قبول کرد فردا بیاید: چاری‌ناچار قەبوولی کرد بەیانی بێت›: **خواەوناخواه**

**خواەوناخواه** / xāh-o-nāxāh/ ☜ **خواه‌ناخواه**

**ـ خواهی** / xāhî ، ـها/: پیوازه. ـ خوازی؛ ـ وازی؛ ویستن؛ خواستن ‹آزادیخواهی: ئازادیـخوازی›.

**خواهی نخواهی** / xāhînaxāhî/: قید. [گفتاری] چاری‌ناچار؛ گەرەک‌ناگەرەک؛ بڤێ‌نەڤێ.

**ـخوئی** / xû'î/ ☜ **ـ خویی**

**خوب** / xob/: قید. ۱. [گفتاری] باش؛ باشە؛ چاکە؛ ئێ؛ وشەیەک بۆ قەبووڵ‌کردنی بیر و باوەڕی کەسێک لەوەلامی پرسیاریدا ‹آزاد گفت: «برویم»، گفتم: «خوب»: ئازاد وتی: «بڕۆین»، وتم: «باش»› ۲. دەی؛ ئەی؛ خاس؛ ئەرێ؛ لە پرسیاری سەبارەت بە درێژەی ڕووداوەیکدا ‹خوب، بعد چی شد؟: دەی، ئیتر چ بوو؟› ✽ **خُب**

**خوب**[1] / xûb/: صفت. باش؛ چاک؛ خاس؛ خوو؛ هەول؛ هاولە: ۱. وەش؛ بە چۆنیەتی دڵخواز ‹هوا خوب است: هەوا باشە› ۲. خاوەن ڕەفتار و کرداری چاک و دڵخواز ‹آدم خوب: مرۆی چاک› ۳. وەش؛ چابووەوە ‹زخمش خوب شد: زامەکەی چاک بووەوە› ٤. [ادبی] جوان؛ لەبار؛ پەسند؛ خشکۆک؛ خۆشێک؛ قەشەنگ ‹روی خوب: ڕوخساری جوان›.

**خوب**[2]: قید. باش؛ چاک؛ خاس؛ عال؛ بەبار یان چۆنیەتی بەدڵ؛ شیاو یان خۆش‌هاتوو ‹امیر خوب کار می‌کند: ئەمیر باش کار دەکا›.

▣ **خوب آوردن**: جەخت هێنان؛ باش هێنان؛ بۆ هاتن؛ لەگەڵ ڕووداوێکی باش ڕووبەڕوو

بوونەوە.

**خوب کردن:** ١. دەرمان‌کردن؛ چا کردن؛ خاس‌کردنەوە؛ وەش‌کەردەیوە ‹آن دارو زخم پایم را خوب کرد: ئەو دەرمانە زامی لاقمی چا کردەوە› ٢. چاک کردن؛ خاس‌کردن؛ کارێکی باش کردن‹پرویز خوب کرد کە توی این سرما نیامد: پەرویز چاکی کرد لەم جەوەرەدا نەهات›.

هەروەها: **خوب بودن؛ خوب شدن**

**خوبرو** / xûbrû ، ـها؛ ـیان/: *صفت. [ادبی]* جوان؛ جوانخاس؛ جوان‌چاک؛ جوان‌چاڵ؛ پەسند؛ خوشیک؛ خوشۆک؛ خشکۆک؛ خاوەن ڕوومەتی جوان.

**خوبی** / xûbî/: *اسم.* چاکی؛ باشی؛ خاسی: ١. /ـها/ کاری چاکە؛ کار یا ڕەوتی یارمەتی دان و هاوکاری کردنی کەسێک ‹خوبی کردن ضرری ندارد: چاکە کردن زیانێکی نیە› ٢. قەنجی؛ پەسندی؛ دۆخ یان چۆنیەتی باش بوون ‹در خوبی و انسانیت نمونه بود: لە چاکی و مرۆڤایەتیدا هەڵکەوتە بوو›.

▣ **خوبی به کسی نیامدن:** چاکە بۆ کەسێک نەبوون؛ شیاوی یارمەتی و مێرەوانی نەبوون ‹به آرام خوبی نیامده: چاکە بۆ ئارام نابێ›.

**خوبی کردن:** چاکەکردن؛ خاسی‌کردن؛ باشەکردن؛ یارمەتی و میهرەوانی کردن ‹خیلی به ما خوبی کرده: زۆری چاکە لەگەڵمان کردووە›.

**خوبیت** / xûbîyyat/: (!) [فارسی/ عربی] *اسم. [گفتاری]* باشی؛ چاکی؛ شیاوی؛ گونجاوی‹این کار هیچ خوبیتی ندارد: ئەم کارە هیچ باشیەکی تێدا نیە›.

**خوپذیر** / xûpazîr ، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* خووگر؛ هۆگر؛ هەبوونی تایبەتمەندیێک بۆ گرتنی خوو یان ڤەوینی ‹نفس انسان خوپذیر است: نەفسی مرۆ خووگرە›.

**خود**[1] / xod/: *اسم.* خۆ؛ خود؛ خوە؛ خە؛ هو؛ وێ: ١. سەرجەمی لەش، هزر ، بیر و هەرچێکی تر کە کەسێکی لێ پێک‌هاتووە؛ هەموو هەست و نەستی کەسێک ‹خود را آزمودن؛ خود را شناختن: خو تاقی کردنەوە؛ خو ناسین› ٢. یەک بوونەوەر بە تەنێ و بێ‌بەشداری ئەوانی دیکە ‹با خود اندیشید: لای خۆیەوە بیری کردەوە›.

▣ **به خودی‌خود:** خۆبەخۆیی؛ خۆی بۆ خۆی؛ بە خۆیی خۆ؛ بە خۆیەوە؛ ژبەر خۆ؛ وێش پەی وێش ‹انسان به خودی خود موجودی اجتماعی است: مرۆڤ خۆبەخۆیی بوونەوەرێکی ئاپۆرەییە›.

▣ **خود را از تک و تا نینداختن:** ورە بەرنەدان؛ خۆ لە دەس نەدان؛ خۆ نەدانە دەسەوە؛ خۆ ڕاگرتن. بەرانبەر: **خود را باختن**

**خود را باختن:** ورە بەردان؛ خۆ دانە دەسەوە؛ لە دەس دانی دەسەڵات بەسەر کردار و گوتاری خۆدا ‹با دیدن آزاد خود را باخت و به لکنت افتاد: هەر ئازادی دی ورەی بەردا و کەوتە پتەـپت›.

**خود را بالا گرفتن:** *[مجازی]* خۆ بە زل زانین؛ خۆ هەڵکێشان؛ وێ زل گێرتەی؛ لە خۆ بایی بوون و خۆ هەڵدان ‹خیلی خودش را بالا می‌گرفت: زۆر خۆی بە زل دەزانی›.

**خود را بستن** ☜ بار خود را بستن، **بار**[1]

**خود را به آن راه زدن:** *[گفتاری]* خۆ گێل‌کردن؛ خۆ کردنە گووکەر؛ خۆ بێ‌ئاگا شان دان ‹خود را به آن راه زد، گویی حرف مرا نشنیده است: خۆی گێل کرد، گوایە قسەکەی منی نەبیستووە›.

**خود را به چیزی زدن:** *[مجازی]* خۆ لە شتێ دان؛ خۆ وا نیشان دان؛ خۆ بە جۆرێ نیشان دان ‹خود را به کری زدن: خو لە کەری دان›.

**خود را به دامن کسی انداختن:** *[کنایی]* خۆ خستنە ماڵی کەسێ؛ پەنا بردنە بەر کەسێک و یاری لێ خواستنی ‹برای پیشرفت کار پسرش خود را به دامن ارباب انداخت: بۆ پێشەوە چوونی کاری کوڕەکەی خۆی خستە ماڵی ئاغا›.

خود را به کوچه‌ی علی چپ زدن: *[مجازی]* خۆ دان لە نەزانی؛ خۆ لێ گێل کردن؛ قسەیەک بە نەبیستراوە زانین یان سەبارەت بە بابەتێ خۆ بێخەوەر نیشان دان ‹وقتی دربارەی کار تو پرسیدم، خود را به کوچه‌ی علی چپ: کاتێ لەمەڕ کارەکەی تۆوە پرسیارم کرد، خۆی دا لە نەزانی›.

خود را جمع کردن: خۆ کۆکردنەوە؛ خۆ جەمکردنەوە؛ خۆ ماقووڵ کردن؛ حاڵەتی فەرمی بە خۆگرتن ‹آزاد که روی تشک لم داده بود، با دیدن پدرش خود را جمع کرد و راست نشست: ئازاد کە لە بان دۆشەکەکەوە هەلاژیابوو، کە چاوی بە بابی کەوت خۆی کۆکردەوە و قیت دانیشت›.

خود را دست کم گرفتن: خۆ بە کەم زانین؛ توانایی یان شیاوی خۆ کەمتر لەوەی هەیە هاتنە بەرچاو ‹تو خودت را دست کم گرفته‌ای: تۆ خۆت بە کەم زانیوە›.

خود را سبک کردن: *[مجازی]* خۆ سووک کردن؛ بوونە هۆی کەم بوونەوەی بایەخ و برەوی خۆ ‹با رفتن پیش این و آن خود را سبک کرد: بە چوون بۆ لای ئەم و ئەو خۆی سووک کرد›.

خود را قاتی کاری کردن: خۆ ئاوێتەی کارێک کردن؛ خۆ لە کارێک تێ هەڵقورتان؛ وێ وسەینە کاریو؛ دەستێوەردان یان بەشداری کردن لە کارێکدا ‹تو خودت را قاتی دعوای زنها نکن: تۆ خۆت ئاوێتەی شەڕ و هەرای ژنان مەکە›.

خود را گرفتن: خۆگرتن؛ قیافە و کرداری ڕەق و نادۆستانە بە خۆ گرتن ‹خیلی خودش را گرفته بود: زۆر خۆی گرتبوو›.

خود را گم کردن: *[مجازی]* خۆ گۆڕین؛ ڕابردووی خۆ لە بیر بردنەوە یان خۆ لێی لادان و ئاوڕ نەدانەوە لە دۆستان و خوێشان ‹وقتی پولدار شد، خودش را گم کرد و دیگر به کس محل نمی‌گذاشت: وەختێ دەوڵەمەند بووەوە، خۆی گۆڕی و ئیدی ئاوڕی لە کەس نەئەدایەوە›.

خود را هلاک کردن: ۱. خۆکوشتن؛ گیانی خۆکێشان ۲. *[مجازی]* خۆکوشتنەوە؛ هەناسەی خۆ بڕین؛ خۆ هیلاک کردن؛ کۆششت و تەپشتی زۆرکردن.

از خود بیخود شدن: واق وڕمان؛ شێوان؛ ماقەوە بوون؛ دەرچوون لە حاڵەتی ئاسایی؛ لەدەس دانی هێوری یان وشیاری خۆ ‹وقتی پسرش را دید از خود بیخود شد و های ـ های گریه کرد: کاتێ کوڕەکەی دی واقی وڕما و پرم ـ پرم گریا›.

از خود درآوردن: لە خۆوە دەرهێنان؛ هەڵبەستن ‹این حرفها را از خودش درآورده بود: ئەم قسانەی لە خووە دەرهێنابوو›.

از خود گذشتن: گیان بەخشین؛ لە خۆ بوردن؛ جە وێ ویەردەی؛ ئامادەی گیان بەخت کردن بوون.

به خود آمدن: هاتنە سەرخۆ؛ هاتنەوە سەر خۆ؛ وە خۆدا هاتن؛ ئامایوە وێرە؛ وەدەس هێنانەوەی هۆشیاری یان هێوری خۆ ‹یک ساعت بعد وقتی به خود امدم همه رفته بودند: پاش سەعاتێک کە هاتمەوە سەرخۆ، گشتیان چووبوون›.

به خود بستن: *[مجازی]* خۆ بە شتێ زانین؛ خۆ هەڵکێشان.

به خود پیچیدن: ئۆقرە لێ بڕان؛ پێچ لە خۆ دان؛ پێچێ دەینەوێ؛ پێچ ئەنە وێ دەی؛ هەڵقرچان و هەدا نەدان لە تاوی ئێشدا ‹از درد به خود می‌پیچید: لە بەر ئێش ئۆقرەی لێ بڕابوو›.

به خود رسیدن: ۱. خەمی خۆ خواردن؛ چاوەدێری خۆ بوون؛ یاوەی وێرە؛ پارێزگاری لە خۆکردن و گەیین بە خۆدا ‹داشتم کلەپاچە

می‌خوردم، آمد و گفت: خوب به خودت می‌رسی!: خەریکی سەر و پێ خواردن بووم، هات و وتی: باش خەمی خۆت دەخۆی!› ٢. خۆ ڕازاندنەوە؛ خۆ گیڤ‌کردن؛ خۆ جوان کردن؛ دەستێ بە خۆدا هێنان ‹پیش از رفتن به عروسی باید کمی به خودم برسم: بەر لەوەی بچم بۆ زەماوەن، دەبێ تۆزێ خۆم برازێنمەوە›.

**به خود گرفتن:** کێشانە سەرخۆ ‹اگر به مرغ کیش می‌گفتی، او به خود می‌گرفت و قهر می‌کرد: ئەگەر کشت لە مریشک دەکرد، ئەو ئەیکێشایە سەر خۆی و دەتۆرا›.

**در خود فرو رفتن:** */مجازی/* چوونە نێو خۆوە؛ لە دنیا دابڕان؛ پێوەندی خۆ لە جیهانی دەور و بەرەوە پساندن و خەریک بوون بە بیر و هزری خۆوە.

**خود**[٢]: ضمیر. خۆ؛ هو؛ خوە؛ خە؛ وێ؛ هی کەسێ یان شتێ ‹مال خودم؛ مال خودشان: هی خۆم؛ هی خۆیان›.

**خودـ**[٣]: *پیشواژە.* خۆـ ؛ خوەـ ؛ وێـ: ١. هی ئەو کەسە یان ئەو شتە کە ئاماژەی پێ کراوە، نە کەسێکی‌تر ‹خودپرست؛ خودپسند: خۆ پەرست؛ خۆپەسن› ٢. بە یارمەتی هەر ئەو شتەی ئاماژەی بۆ کراوە، نە شتێکی‌تر ‹خودتراش: خۆتراش›.

**خود** / xûd/ ☜ **کلاهخود**

**خودآرا** / xodārā/: *صفت.* خۆڕازێن؛ خۆ گیڤکەر؛ خۆ تەوزێن؛ وێ وەشکەر؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە خۆڕازێنی ‹هیچ باور نمی‌کردم آن جوان خودآرا و قرتی، یک روز چنین شخصیتی پیدا کند: هەر باوەڕم نەدەکرد ئا ئەو لاوە خۆڕازێن و خوێڕیە، ڕۆژێ ئاوا کەسایەتییێکی لێ دەربێ›.

**خودآرایی** / xodārāyî ، ـها/: *اسم.* خۆڕازێنی؛ وێ‌وەشکەری؛ هەنگ‌وونگی؛ خۆ ڕازاندنەوە؛ تەوزاندنی خۆ تایبەت بە شێوەیەکی یەکجاری.

**خودآزما** / xodāzmā/: *صفت.* خۆ تاقیکەرەوە؛ خۆ ئەزموو؛ خوەهێچێن؛ وێزمە؛ خاوەن تایبەتمەندی یان توانایی تاقی کردنەوەی خۆ. هەروەها: **خودآزمایی**

**خودآگاهی** / xodāgāhî ، ـها/: *اسم.* خۆ ناسینەوە؛ ئاگاداری کەس لە هەبوون، کاران و بیر و بڕوای خۆ ‹دستیابی به خودآگاهی، باید هدف زندگی ما باشد: گەیشتن بە خۆ ناسینەوە، دەبێ ئامانجی ژیانی ئێمە بێ›.

**خودآموز** / xodāmûz ، ـها/: *اسم.* خۆئامۆژ؛ ئامرازێک (بەتایبەت کتێب) بۆ ڕاهێنانی خوێنەر لە کارێکدا بە بێ یارمەتی‌گرتن لە مامۆستا.

**خودآموزی** / xodāmûzî/: *اسم.* خۆئامۆژی؛ کار یان ڕەوتی فێر بوون، بێ یارمەتی گرتن لە مامۆستا یان دامەزراوەی فێرکاری.

**خوداتکایی** / xod'ettekāyî/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* خۆژێنی؛ کار و ڕەوتی کەڵک وەرگری لە لێهاتوی خۆ، بێ یارمەتی گرتن لە خەڵکی؛ بە سەر پای خۆوە بوون.

**خوداشتغالی** / xod'ešteqālî ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* بار یان دۆخی هەبوونی کارێکی وا کە لە لایەن خودی کەسەکەوە بەڕێوە دەچێ و کرێکار و خاوەن‌کار خۆیەتی.

**خودانگیختگی** / xod'angîxtegî ، ـها/: *اسم.* خۆبزوێنی؛ خۆهاندەری؛ خۆ دنەدەری؛ دۆخ یان چۆنیەتی بزواندنی خۆ بێ دەس تێوەردانی کەسی‌تر. هەروەها: **خودانگیخته**

**خودباختگی** / xodbāxtegî ، ـها/: *اسم.* خۆدۆڕێنی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خۆ دانە دەسەوە؛ لە دەس دانی هێز و توانای ڕۆحی بۆ بەرامبەر بوونەوە لەگەڵ ڕووداوی تاڵ و ترشی ژیاندا. هەروەها: **خودباخته**

**خودباوری** / xodbārvarî ، ـها/: *اسم.* لە خۆڕا بینی؛ دەخۆدا بینی؛ دۆخ و چۆنیەتی بە خۆدا پەرمیان و بڕوا بە لێهاتوویی خۆ.

**خودبخود** / xodbexod/: *قید.* ١. لە خۆڕا؛

ژبەرخۆ؛ لە خۆوە؛ هەر لە خۆوە؛ لە خۆیەوە؛ بخۆ؛ هەر بۆ خۆی؛ ویشۆ؛ ویشوە؛ ویشەوە؛ بە شێوەی نەویستی ‹خودبخود چشمم قرمز شد: لە خۆرا چاوم سوور بوو› ٢. بۆخۆی؛ پەی ویش؛ خۆ بە خۆ؛ بێبەشداری یان دەس تێوەردانی کەسیتر ‹خودبخود کارش را می‌کند و احتیاجی به سفارش نیست: بۆ خۆی کاری خۆی دەکا، ڕاسپاردنی ناوێ›. هەروەها: **خودبخودی**

**خودبری** / xodborî/: اسم. [زیست‌شناسی] تایبەتمەندیەک لە برێ گیانەوەران (وەکوو مارمێلک) کە لە کاتی مەترسیدا بۆیان دەلوێ یەکێ لە ئەندامەکانی خۆیان ببڕن. زۆرتر ئەو ئەندامە دوایی دەردێتەوە.

**خودبزرگ‌بینی** / xodbozorgbînî/: اسم. لووتبەرزی؛ خۆ بە زل زانی؛ خۆبینی لە ڕادەبەدەر و نەخۆش ئاسایی. هەروەها: **خودبزرگ‌بین**

**خودبسندگی** / xodbasandegî/: اسم. خۆبژیوی؛ خۆبەڕێوەبەری؛ کار یان ڕەوتی دابین‌کردنی پێداویستی خۆ، بێ پاڵپشتی کەسێکیتر.

**خودبین** / xodbîn/: صفت. خۆخوا؛ خۆبین؛ خۆپەسند؛ خۆنما؛ وێوین؛ گەڤەزە؛ مەنەری؛ خاوەن خوو و خدە یان وازی خۆبینی.

**خودبینی** / xodbînî ، ـها/: اسم. خۆبینی؛ خودبینی؛ خۆپەسندی؛ فیز؛ بادی هەوایی؛ خوو یان ئوگرەتی زەینی بەوەی کەسێک خۆی باشتر و بەرزتر لە دیتران بزانێ.

**خودپایی** / xodpāyî/: اسم. خۆپارێزی؛ کار و ڕەوتی پاراستنی خۆ لە هەمبەر مەترسی و زیانی ناکاویەوە.

**خودپرداخت** / xodpardāxt/: اسم. بەشێ لە خەرج (وەک پارەی دەرمان) کە بە پێی هەلومەرجی بیمەنامە، بە ئەستۆی بیمەدەرە.

**خودپرداز** / xodpardāz ، ـها/: اسم. کەرەسەیەکی ئیلیکترۆنیکی کە پارەی پێویست بە شێوەی خۆمەش ئاراستە دەکا.

**خودپرست** / xodparast ، ـها؛ ـان/: صفت. خۆپەرست؛ خۆپەرس؛ وێپەرێس؛ وێواز؛ خۆخواز؛ خاوەن خوو یان ئوگرەتی بە خۆپەرستی.

**خودپرستی** / xodparastî ، ـها/: اسم. خۆپەرستی؛ خۆخوازی؛ خوو یان ئوگرەتی زەینی بەوەی کە کەسێ خۆی لە هەموو کەس خۆشتر بوێ و ئاور لە قازانج یان ئاسایشی خەڵک نەداتەوە.

**خودپژوهی** / xodpajûhî/: اسم. کار یان ڕەوتی خۆ هەڵسەنگاندن؛ لە خۆ تۆژینەوە؛ خوە هلکەوشاندن؛ خۆ دانە پەی؛لێکۆڵینەوە لە توانایی، لێنەهاتووی و هەموو کردەوەیەکی خۆ. هەروەها: **خودپژوە**

**خودپسند** / xodpasand ، ـها؛ ـان/: صفت. خۆهەڵکێش؛ کاو؛ بەفیز؛ بفر؛ گەڤەزە؛ گەبەزە؛ پارسوستور؛ خۆپەسن؛ خۆپەسند؛ خودپەسند؛ خۆ بەزل زان؛ لە خۆ بایی؛ بادیهەوا؛ خاوەن هۆکارە یان وازی لە خۆ خۆش هاتن.

**خودپسندی** / xodpasandî ، ـها/: اسم. خۆپەسنی؛ خۆپەسندی؛ کەشخەیی؛ گەڤەزەیی؛ قۆڕەدەماخی؛ بادیهەوایی؛ خدەی خۆ پەسند؛ خۆ باشتر لە دیتران زانین.

**خودتخریبی** / xodtaxrîbî/: [فارسی/ عربی]/اسم. خۆخۆری؛ خەسار لە خۆ دان؛ کار یان ڕەوتی ئازار گەیاندنی قەستی بە خۆ.

**خودتراش** / xodtarāš ، ـها/: اسم. خۆتراش؛ کەرەسەیێک بۆ مووتاشین.

**خودتنبیهی** / xodtambîhî, -tanbîhî/: [فارسی/ عربی]/اسم. لە خۆ دەری؛ کار و ڕەوتی لە خۆ دان و خۆ تەمێ کردن.

**خودتنظیم** / xodtanzîm/: [فارسی/ عربی] ☜ **خودسامان**

**خودجوش** / xodcûš/: *صفت*. خۆبەخۆ؛ خاوەن زیوە و ئاخێزیانی ژبەرخۆیی، بێ دەس تێوەردانی کەس یان کەسانیتر.

**خودچسب** / xodčasb، ـها/: *صفت*. خۆچەسب؛ خۆنووس؛ خوەزانقی؛ خاوەن چەسپی سروشتی.

**خودخوانده** / xodxānde/: *صفت*. خۆدانـاو؛ ناونراو لە لایەن خـۆوە بەبێ پەسـندی گـشتی ‹دولت خودخوانده: دەوڵەتی خۆدانـاو›.

**خودخواه** / xodxāh، ـها؛ ـان/: *صفت*. خۆخـواز؛ خۆبین؛ خۆپەسند؛ خۆویست؛ بەفیز؛ بایی‌هەوا؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە خۆخوازی.

**خودخواهی** / xodxāhî، ـها/: *اسم*. خۆخـوازی؛ خۆخوایی؛ بەفیزی؛ خۆبینی؛ خوو یان ئـۆگرەتی بە دابین‌کردنی داخوازی و ئاسایشی خۆ، بێ لـە بەر چاو گرتنی قازانج و زیانی خەڵک.

**خودخوری** / xodxorî، ـها/: *اسم*. خۆخـوەری؛ خۆخـۆری؛ خـەزازی؛ کـار و ڕەوتی خـەم و خەفـەتی زۆر خـواردن و نەدرکانـدنی لـە لای خەڵکەوە. هەروەها: **خودخور**

**خـودداری** / xod.dārî، ـها/: *اسم*. خـۆداری؛ خودداری؛ خۆڕاگری؛ خۆپارێزی؛ پشوو لـە سـەر خۆیی؛ کار یان ڕەوتی بەرخۆ گرتن؛ خۆ ڕاگرتن؛ دەس ڕاگرتن؛ بـەرگری‌کـردنی خـودی کـەس: *الف)* لە جێبەجێ کردنی کارێ لە لایەن خۆیەوە ‹از ریختن زباله در این مکان خودداری کنید: لـە زبـڵ خستنە ئەم شوێنە، خۆداری بکەن› *ب)* لـە ئاشـکرا بوونی هەیەجانگەلی هزری و بەرپەرچی واتـایی خۆی ‹خنده‌ام گرفته بـود، ولـی از خندیـدن خـودداری می‌کردم: پێکەنینم دەهات، بەڵام بەر خۆم دەگرت›. هەروەها: **خوددار**

**خودرأی** / xodra'y، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت*. هەڵەشـە؛ سـەرەڕۆ؛ لاسـار؛ گـوێنـەبیس؛ سەهەندە؛ نەژنەوا؛ خۆڕا؛ بلـەوەز؛ خـاوەن خـوو یان ئۆگرەتی گوێ نەگرتن بۆ قـسەی دیتـران و هەڵنەگرتنی بیر و باوەڕی کەسی‌تر. هـەروەها: **خودرأیی**

**خودرنگ** / xodrang/: *صفت*. سروشتی ڕەنـگ؛ خاوەن ڕەنگی سروشتی. هەروەها: **خودرنگی**

**خودرو** / xodrow، ـها/: *اسم*. ماشـێن؛ ماشێن؛ ترومبیل؛ ترۆمبێل؛ سەیارە.

**خـودرو** / xodrû، ـهـا/: *صـفت*. خۆڕسـک؛ خۆڕسـت؛ خـۆوەر؛ خـۆدەر؛ خـواکرد؛ بـە تایبەتمەنـدی ڕوانی خۆبـەخۆیی، بـێ ئـەوەی کەسێک چاندبێتی ‹گل خودرو: گوڵی خۆڕسک›.

**خودروب** / xodrûb، ـها/: *صفت*. خۆماڵ؛ بـە تایبەتمەندی یان توانای خاوێن‌کـردنی خـۆ بـە شێوەی خۆمەش.

**خودزنی** / xodzanî/: *اسم*. خۆبـڕی؛ خۆکـوژی؛ کار و ڕەوتی لە خۆ دان.

**خودساخته** / xodsāxte/: *صفت*. خۆکر؛ خـاوەن تایبەتمەنـدی پـەروەردەیی و پێـشڕەوت لـە ئاکـامی تێکۆشـانی خـۆ ‹مـرد خودساخته: پیاوی خۆکر›.

**خودسازگار** / xodsāz(e)gār/: *صفت*. خۆسـاز؛ خاوەن تایبەتمەندی یان توانای ساچان یان خۆ ڕێکخـستن لەگـەڵ دۆخ یـان دیاردەیـەکی دیاریکراودا بە شێوەی خۆمەش.

**خودسازی** / xodsāzî/: *اسم*. خۆپـەروەری؛ کـار یان ڕەوتی بارهێنان و پەروەردە کردنی خۆ.

**خودسـامان** / xodsāmān/: *صفت*. خۆسـامان؛ خـۆمرێس؛ خۆتـەکووز؛ خۆپـۆڕ؛ خـۆوەژێر: ١. خاوەن تایبەتمەندی یان توانای ڕێـکوپێـک کردنی کاری خۆ ٢. خاوەن تایبەتمەنـدی یـان توانای ڕێکوپێک بـوون بـە شـێوەی خۆکـار * **خودتنظیم**

**خودسـتا** / xodsetā، ـهـا؛ ـیـان/: *صفت*. *[ادبی]* خۆپەسێن؛ خۆپەسند؛ خۆپەسن؛ خۆهەڵـکێش؛ فۆرتەک؛ منمنۆک؛ خاوەن هوکارە یان ئۆگرەتی بە خۆپەسێنی.

**خودستایی** / xodsetāyî، ـها/: *اسم*. خۆپەسێنی؛

هۆشەکاری؛ بافیش؛ فشە؛ فشەفش؛ چاوڕاو؛ هەلات؛ کار یان ڕەوتی بە خۆدا هەڵگوتن؛ قاپان؛ خۆهەڵکێشان؛ لەمەڕ چاکە و تواناییگەلی خۆوە دوان.

▣ **خودستایی کردن**: چیف؛ قاپان؛ خۆ هەڵکێشان؛ بە خۆدا هەڵگوتن.

**خودسر** / xodsar ، ـها؛ ـان/: *صفت.* خۆسەر؛ خودسەر؛ سەربەردایی؛ خۆڕایی؛ کێزر؛ بێخۆ؛ لە خۆخرە؛ سەربزێو؛ سەربە خۆ؛ خاوەن هۆکارە یان ئۆگرەتی بەوەی کە قسە هەر قسەی خۆی بێ ‹جوان خودسر: لاوی خۆسەر›.

**خودسرانه**[1] / xodsarāne/: *صفت.* خۆسەرانە؛ هەر وەک خۆسەران ‹رفتار خودسرانه: ئاکاری خۆسەرانە›.

**خودسرانه**[2]: *قید.* خۆسەرانە؛ بە ویست و دڵخوازی خۆ و بێ‌بەرایی کەسێکی‌تر ‹وقتی خودسرانه زن گرفت، اعضای خانواده ترکش کردند: کاتێ خۆسەرانە ژنی خواست، بنەماڵەکەی لێی تەکینەوە›.

**خودسری** / xodsarî ، ـها/: *اسم.* خۆسەری؛ خودسەری؛ لاساری؛ سەربەخۆیی؛ کێزری؛ کار یان ڕەوتی شوێن خواست و ویستی خۆ کەوتن و ئاوڕ نەدانەوە لە داخواز یان ڕێنوێنی گەورەتر یان خاوەن پلەی بانتر؛ کار بە ئارەزووی خۆ کردن؛ گوێ نەدان بە قسەی کەس؛ بەرهەڵدایی و کاری سەربەخۆ کردن ‹وقتی زن گرفت خودسری را کنار گذاشت و سر به راه شد: کاتێ ژنی خواست خۆسەری نا لاوە و هاتە سەر ڕێ›.

**خودسوزی** / xodsûzî ، ـها/: *اسم.* خۆسووتێنی؛ وێسۆچنەی؛ خۆ کوشتن بە ئاگر ‹در اعتراض به بازداشت اوجالان، کردهای زیادی دست به خودسوزی زدند: بۆ نارەزایەتی دەربڕین سەبارەت بە گرتنی ئوجالان، کوردێکی زۆر دەسیان دایە خۆسووتێنی›.

**خودشناسی** / xodšenāsî/: *اسم.* خۆناسی؛ کار یان ڕەوتی ناسینی توانایی، بیر و باوەڕ، خوو، ئاکار و کەم و کورتی خۆ.

**خودشیرینی** / xodšîrînî ، ـها/: *اسم. [مجازی]* خۆشیرینی؛ کرد و کۆش بۆ باش ڕانانی خۆ لە چاو کەسێکەوە؛ خۆ شیرین کردن؛ خۆ خۆشەویست کردن ‹تو با این کارت می‌خواستی پیش رئیس خودشیرینی کنی: تۆ بەم کارەت دەتەویست لە لای سەرۆکەوە خۆشیرینی بکەی›.

**خودشیفتگی** / xodšîftegî/: *اسم. [روانشناسی]* خۆگەرەکی؛ ئۆگرەتی نەخۆش‌ئاسایانە بە خۆ و خۆ بە زۆر باشتر، جوانتر و شیاوتر زانین.

**خودشیفته** / xodšîfte ، ـها؛ ـگان/: *صفت. [روانشناسی]* خۆگەرەک؛ تووشی نەخۆشی خۆگەرەکی.

**خودفرمان** / xodfarmān ، ـها/: *صفت.* سەربەخۆ؛ خاوەن تایبەتمەندی یا خووی کارکردن بە خواست و فەرمانی خۆ. هەروەها: **خودفرمانی**

**خودفروخته** / xodfurûxte ، ـها؛ ـگان/: *صفت. [کنایی]* خۆفرۆش؛ خاوەن دۆخ یان چۆناوچۆنیەک کە بۆ بەدەس هێنانی شتێک، خۆی ناوبێتە ژێر دەسەلات و ویستی کەسێ یان کەسانی‌ترەوە ‹چند خودفروخته می‌خواستند آشوب به پا کنند: چەند خۆفرۆش دەیانویست بشێوە بنێنەوە›.

**خودفروش** / xodfurûš ، ـها؛ ـان/: *صفت. [کنایی]* خۆفرۆش؛ بڤکێ: ۱. هیز؛ حیز؛ گاندەر ۲. خاوەن خوو یا ئۆگرەتی بە خۆفرۆشی ۳. *[ادبی]* کەللەبا؛ خۆنوێن؛ خۆنما.

**خودفروشی** / xodfurûšî/: *اسم.* ۱. خۆفرۆشی؛ کار یان ڕەوتی خۆ فرۆتن ۲. ـها/ حیزی؛ هیزی ۲. ـها/ *[ادبی]* خۆنوێنی؛ خۆنمایی؛ کەللەبایی.

**خودکار**[1] / xodkār ، ـها/: *اسم.* قەلەم‌ئووچ؛ جۆرێک بنووس بە مەرەکەفی چەورەوە.

**خودکار**[2]: *صفت.* خۆمەش؛ خۆکار؛ خۆگەڕ: ۱. ـها/ بە تایبەتمەندی یان توانایی ئەنجامدانی

کار یان کارانێکی دیاریکراو، بێ‌نیاز بە دەستێوەردانی کەسێک ‹ساعت خودکار: سەعاتی خومەش› ٢. خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە کردنی کارەکانی خۆ بێ سەرپەرەشتی و ڕێنوێنی کەسانی دیکە.

**خودکارسازی** / xodkārsāzî/: اسم. ١. /ـها/ قەڵەم‌ئووچ سازی؛ کارگا یان کارخانەی دروس کردنی قەڵەم ئووچ ٢. خۆمەشکەری؛ خۆکارسازی؛ کار یان ڕەوتی خۆمەشکردنی کاروبار (وەک بەرهەم هێنان، گواستنەوە و...).

**خودکاری** / xodkārî/: اسم. خۆکاری؛ خۆمەشی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خۆکار بوون ☜ **خودکار٢ـ٢**

**خودکافت** / xodkāft/: صفت. [زیست‌شناسی] خۆخۆر؛ خاوەن تایبەتمەندی یان تووشی دیاردەی خۆخۆری بوون.

**خودکافتی** / xodkāftî/: اسم. [زیست‌شناسی] خۆخۆری؛ کار و ڕەوتی هەڵوەشانەوە و لە بەر یەک چوون و دارزانی لەشی گیاندارێک دوای مردنی.

**خودکامگی** / xodkāmegî، ـها/: اسم. سەرەڕۆیی؛ گوێ‌نەبیسی؛ لاساری؛ لە خۆ خەڕەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرەڕۆ بوون.

**خودکامه** / xodkāme، ـها؛ ـگان/: صفت. سەرەڕۆ؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی کەوتنە شوێن ویست و بیر و ڕای خۆ، بێ‌ڕاوێژکردن لەگەڵ کەسانی‌تر یان گوێ‌دان بە باوەری دیتران ‹حکومتهای خودکامه را مردم حمایت نمی‌کنند: خەڵک لە حکومەتی سەرەڕۆ، پشتیوانی ناکەن›.

**خودکاوی** / xodkāvî/: اسم. خۆپشکنی؛ خۆکنەیی؛ کار و ڕەوتی خۆدۆزین؛ لە خۆ کۆڵینەوە. هەروەها: **خودکاو**

**خودکرده** / xodkarde/: صفت. خۆکردە؛ خۆکردوو؛ وێ‌کەردەی؛ جێبەجێ بوو بە هۆی خودی کەسەوە ‹خودکرده را تدبیر نیست: خۆکردە چاری ناچارە›.

**خودکشی** / xodkošî، ـها/: اسم. خۆکوژی؛ کاری خۆکوشتن؛ خۆ لە ناو بردن.

⊡ **خودکشی کردن**: خۆکوشتن ‹صادق هدایت در سال ١٣٣٠ خودکشی کرد: سادق هەدایەت لە ساڵی ١٣٣٠(ک.هـ.)دا خوی کوشت›.

**خودکفا** / xodkafā, -kefā/: [فارسی/ عربی] صفت. خۆدابین؛ توانا بە دابین‌کردنی پێداویستگەلی خۆ، بێ یارمەتی یان کەڵک‌وەرگری لە کەسانی‌تر ‹در جهان امروز هیچ کشوری صددرصد خودکفا نیست: لە دنیای ئەمڕۆدا هیچ وڵاتێ، سەتاسەت خوبژیو نیە›. هەروەها: **خودکفا بودن؛ خودکفا شدن؛ خودکفا کردن**

**خودکفایی** / xodkafāyî, -kefāyî/: [فارسی/ عربی] اسم. خۆبژیوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خۆبژیو بوون.

⊡ **به خودکفایی رسیدن**: بە خۆبژیوی گەیشتن ‹در سالهای اخیر در تولید گندم به خودکفایی رسیدیم: لەم ساڵانی دواییە، لە بەرهەم هێنانی گەنمدا، گەیشتینە خوبژیوی›.

**خودگردان** / xodgardān/: صفت. سەربەخۆ؛ خۆگەڕێن؛ بە دۆخ یان باری سەربەخۆییەوە ‹حکومت خودگردان: حکومەتی سەربەخو›.

**خودگردانی** / xodgardānî/: اسم. سەربەخۆیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەڕێوە چوون لە لایەن خەڵک یان نوێنەرانیانەوە ‹آنها سالها برای کسب خودگردانی جنگیدند: زۆر ساڵان بۆ بەدەس هێنانی سەربەخویی خەباتیان‌کرد›.

**خودگزینی** / xodgozînî/: اسم. خۆهەڵبژێری: ١. کار و ڕەوتی هەڵبژاردنی خۆ ٢. کار و ڕەوتی هەڵبژاردن لە لایەن خودی کەسەوە.

**خودمانی**[1] / xodemānî/: صفت. [گفتاری] خۆمانی؛ خومانی؛ وێمانە: ١. بێ‌گرێ‌وگۆڵ؛ بە کوڵ و کۆی دۆستانەوە ‹رفتار خودمانی: ئاکاری خومانی› ٢. خۆمانە؛ لە خۆمان؛ بەش بە خۆمان؛

دژیَ بێگانه ‹او خودمانی است، بیگانه نیست: ئەو خومانەیە، بێگانە نیە›.

**خودمانی**[٢]: *قید. [گفتاری]* خۆمانیانە؛ خۆمانی؛ خۆمانە؛ وێمانە؛ بە شێوەیەکی دۆستانە، بێئاوڕدانەوە لە ڕەسم و یاسا ‹خیلی خودمانی بە او گفتم: کاری کە تو می‌کنی، عاقبت خوشی ندارد: زۆر خومانیانە پێم گوت: ئەم کارە تۆ دەیکەی، سەرەنجامێکی باشی نابێ›.

**خودمحوری** / xodmehvarî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* ١. دۆخ یان چۆنیەتی بە تەوەرە و چەق دانانی هزر و بیری خۆ، بۆ هەر جۆرە بۆچوون و بڕیارێک ٢. دۆخ یان چۆنیەتی هزر و خواستی خۆ بە بنج و بنەمای هزر و خواستی دیتران زانین: **خودمداری**. هەروەها: **خودمحور**

**خودمختار** / xodmoxtār/: [فاسی/ عربی] *صفت.* سەربەخۆ؛ خۆگەڕێن؛ خاوەن سەربەخۆیی.

**خودمختاری** / xodmoxtārî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* سەربەخۆیی؛ خۆگەڕێنی؛ کار یان ڕەوتی بەڕێوە بردنی کار و باری ناوخۆ و دابین‌کردنی ئاتاجگەلی خۆ، بە دەستی خۆ و بێ دەستێوەردانی نامۆیان.

**خودمداری** / xodmadārî/: [فارسی/ عربی] ☜ **خودمِحوَری**

**خودمیرا** / xodmîrā/: *صفت.* خۆکوژێن؛ خاوەن تایبەتمەندی یان توانای کوژاندنەوە یان لە کار خستنی خۆ بە شێوەی خۆکار.

**خودنما** / xodnemā، ـها/: *صفت.* خۆنوێن؛ خۆنما؛ خۆڕانەر؛ کەللەبا؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە خۆنوێنی.

**خودنمایی** / xodnemāyî/: *اسم.* خۆنوێنی: ١. /ـها/ خۆنمایی؛ کردەوە یان چۆناوچۆنی نیشاندان و ڕانانی جوانی، دارایی یان کارانی خۆ؛ خۆنواندن؛ خۆڕانان؛ خۆ نوانن؛ وێئرمانەی؛ خۆ بە غللووری نیشان دان ‹کارشان رفتن بە شب‌نشینی و خودنمایی و تفاخر بود: کاریان چوونە شەونشینی و خونوێنی و فیز و دەمارفرۆشی بوو› ٢. دۆخ یان چۆنیەتی خۆنواندن؛ دەرکەوتن و دیاردان ‹ماه از پشت درختان خودنمایی می‌کرد: مانگ لە پشتی دارەکانەوە خۆی دەنواند›.

**خودنویس** / xodnevîs، ـها/: *اسم.* پاندان؛ خۆنووس؛ قەڵەم پاندان؛ قەڵەم جاف؛ پێنووسێ کە خەزێنەیێکی بۆ جەوهەر هەیە و بە گوشاری سەری، جەوهەر هێدی‌ـهێدی دەڕژێتە ناو نووکەکەیەوە و دەنووسێ.

**خودی** / xodî، ـها/: *صفت.* خۆیی؛ خۆمانە؛ وێمانە؛ خوەیی؛ ماڵخۆ؛ خۆماڵی؛ ناڤخۆ؛ پێوەندیدار یان بەند بە خودی کەس یان دەستەیەکەوە. بەرانبەر: **بیگانە** ‹تقسیم جامعە بە خودی و غیرخودی خطرناک است: دابەشینی کۆمەڵگا بە خویی و ناخویی پرمەترسیە›.

**خودیابی** / xodyābî، ـها/: *اسم.* کار یان ڕەوتی خۆدۆزینەوە؛ ناسین و دۆزینەوەی توانایی و لێهاتوویگەلی خۆ ‹خودیابی قدم نخست خودباوری است: خۆ دوزینەوە یەکەم هەنگاوی لەخۆڕابینیە›.

**خودیاری** / xodyārî، ـها/: *اسم.* خۆیاری؛ کار یان ڕەوتی یارمەتی‌دانی کەس یان تاقمێک بۆ دابین‌کردنی پارە و پێداویستی خۆیان ‹این مدرسە از راه خودیاری مردم ساختە شدە است: ئەم قوتابخانەیە بە خویاری خەڵک کراوەتەوە›.

**خور**[١] / xor، ـها/: *اسم.* ڕێژگە؛ دەمی چۆم لە شوێنی گەیشتنی بە زەریا، کە لەوێدا شەپۆل و ئاوی چۆم یەک دەگرن.

**ـ خور**[٢]: *پیواژە.* ـخۆر؛ ـخوەر؛ ـوەر: ١. /ـها/ بخۆر؛ بخوەر؛ خۆرا ‹نان‌خور: نان‌خۆر› ٢. ـگر؛ بەرکەوتوو؛ لێکەوتوو؛ جێگرتوو لە بەرامبەر شتێکەوە ‹بادخور: باخور›.

**خوراک** / xorāk، ـها/: *اسم.* خۆراک؛ خوراک: ١. هەردە؛ خوارن؛ خواردن؛ خواردەمەنی؛ خواردنی؛ واردەمەنی؛ خورد؛ واردە؛ ڕوەرە؛ چەرە؛ چێشت؛ ئەوەی بۆ لابردنی برسیەتی

دەخورێت ‹خوراک روزانە: خۆراکی ڕۆژانە›
۲. [مجازی] پێخۆر؛ شێو؛ چێشتێ کە لێ‌ئرابێ
۳. هێندێ لە دەرمان کە بە جارێک ئەخورێ
٤. [مجازی] پێز؛ کالەدوند؛ ماکی سەرەکی پێویست بۆ شتێک ‹این الیاف خوراک چهارماه کارخانه را تأمین می‌کند: ئەم هەودایە خۆراکی چوارمانگی کارخانەکە دابین دەکا›.

**خوراکی**[1] / xorākî ، ـها/: اسم. خواردەمەنی؛ واردەمەنی؛ خۆرەک؛ خۆراک؛ خۆراکی؛ چشت‌مشت؛ خواردەمەنیگەلی جگە لە پێخۆری ڕۆژانە کە زیاتر بۆ چێژ وەرگرتن دەخورێت (وەک شیرینی، چەرەز، میوە، چلوورە و...): تنقلات

**خوراکی**[2]: صفت. خواردەمەنی؛ خواردنی؛ لە باوی خواردن ‹میوەی این درخت خوراکی است: بەری ئەم دارە خواردەمەنیە›.

**خوراندن** / xorāndan/: مصدر. متعدی. //**خوراندی**: خۆراندت؛ **می‌خورانی**: دەخۆرێنی؛ **بخوران**: بخۆرێنە// دەرخوارد دان؛ دەخوارد دان؛ دانە دەرخوارد؛ پەژقاندن: ۱. خۆراندن؛ خۆرانن؛ وەردایش؛ پێخۆر دان بە گیاندارێک ‹با پستانک به او شیر خوراند: بە مەمکەمژە شیری دایە دەرخواردی› ۲. بە زۆر شتێک دانە گیاندارێک بیخوا ‹به زحمت توانستم شربت را به او بخورانم: بە ئاستەم توانیم شەربەتەکە بەمە دەرخواردی› ۳. [مجازی] دانەخورت؛ خستنە جێ؛ شیاندن ‹به هزار زحمت آن قطعه را به موتور خوراندم: بە هەزار دەردیسەری ئەو تیکەم دایە خورتی موتۆرەکە›: **خورانیدن**. هەروەها: **خوارندنی**

■ صفت فاعلی: **خوراننده** (دەرخواردەدەر)/ صفت مفعولی: **خورانده** (دەرخواردراو)/ مصدر منفی: **نَخوراندن** (دەرخوارد نەدان)

**خورانیدن** / xorānîdan/ ☜ **خوراندن**

**خورجین** / xorcîn/: [از عربی] ☜ **خُرجین**

**خورجینک** / xorcînak/: [از عربی/ فارسی] ☜ **خُرجینک**

**خور-خور** / xorxor ، ـها/: صوت. پرخەپرخ؛ مرخەمرخ: **خُر-خُر**

**خورد** / xord/: اسم. ۱. خورد؛ خۆراکی؛ خواردەمەنی؛ خواردنی؛ هەردە؛ واردە؛ وەرە؛ پێخۆر ‹خورد و خوراک: خورد و خۆراک› ۲. ـها/ [خیاطی] چینی زۆر ورد کە بە کێشانی بەنی تەقەڵ لە درووماندا درووس ئەبێ.

▣ **به خورد کسی دادن**: بە دەرخوارد کەسێک دان؛ دانە دەرخواردی کەسێ ‹غذای شب مانده را به خورد من داد: چێشتی شەومەنەی دایە دەرخواردم›.

**خورد** / xûrd/ ☜ **خُرد**

**خوردبین** / xûrdbîn/ ☜ **خُردبین**

**خوردبینی** / xûrdbînî/ ☜ **خُردبینی**

**خوردگی** / xordegî ، ـها/: اسم. خوراوی؛ داخوراوی؛ دارزاوی؛ ئەرەواردەی؛ پواوی؛ ساویاگی؛ کەلی؛ زەپ دیتوویی، پرتووکاوی یان ڕووشاوی بەهۆی هۆکارگەلی میکانیکی، فیزیکی، کیمیاوی یان کۆیێک لەوانەوە ‹خوردگی فلزات: خوراوی کانزاگەل›.

**خوردن** / xordan/: مصدر. متعدی. لازم. // **خوردی**: خواردت؛ **می خوری**: دەخۆی؛ **بخور**: بخۆ// خواردن:
□ متعدی. ۱. خوارن؛ خارن؛ فارن؛ وەردش؛ وەردایش؛ واردەی؛ هەردن؛ هەردەن؛ قووت‌دانی پێخۆر (زۆرتر دوای جاوین) لە ڕێی گەرووەوە بەرەو گەدە ۲. [گفتاری] خواردنەوە؛ هەڵقوڕان؛ قەخارن؛ ئەوەواردەی؛ واردەیوە ‹آب خوردن: ئاو خواردن› ۳. قووت دان؛ داپەچنین؛ داقورتاندن؛ هشاقتن؛ لەپنەی؛ ئاسەیرە ‹کلاغ صابون را خورد: قەلەکە سابوونەکەی خوارد› ٤. داگیرکردن؛ واردەی؛ بە ناڕەوا خۆ بە خاوەنی شتێ‌کردن ‹مال کسی را خوردن: ماڵی کەسێ خواردن›
۵. دانەبا؛ بە با دان؛ مەزخاندن؛ خەرج و باخت‌کردن ‹هر چه از پدرش مانده بود خورد: هەرچی

له باوکیەوە بە جێ مابوو خواردی› ٦. ☜ فرو خوردن، **فرو** ٧. خواردنەوە؛ ئاڵۆش هێنان؛ خستنە خارشت؛ بەدیهێنانی خوریان یا ماسین بەهۆی پێوە تەقان و ساویانەوە ‹لباس پشمی تنم را می‌خورد: بەرگی لە خوری لەشم دەخوانەوە› ٨. خواردنەوە؛ واردەیرە؛ دارزاندن؛ پواندن؛ بەدیهێنانی پرتووکاوی و دارزیاگی ‹عرق دستش پشت ساعت را خورده بود: ئارەقی دەستی پشتی ساعەتەکەی خواردبوو› ☐لازم. ٩./مجازی/ کەوتنە بەر ئازار یان تەوەرەیەکەوە ‹خودش هم نفهمید از کجا خورده است: خۆیشی نەیزانی لە کوێوە خواردوویەتی› ١٠. چۆک دان؛ شکست خواردن؛ دۆڕاندن ‹خیال می‌کنی من از تو می‌خورم؟: وادەزانی من لە بەرانبەر تۆوە چوک دەدەم؟› ١١. دان؛ کەوتن؛ شتێ لێدان ‹گلولە خوردن؛ زمین خوردن: گوللە خواردن؛ کەوتنە زەوی› ١٢. کەوتنە بەر تاو یان تەوژمی شتێکەوە ‹اتو خوردن؛ غصه خوردن: دەق خواردن؛ خەفەت خواردن› ١٣. پێکەفتن؛ پنەواردەی؛ یەک گرتنەوە ‹این رنگ به دیوار می‌خورد: ئەم ڕەنگە بە دیوارەکە نەخوا› ١٤. هاوکات بوون؛ هەوگاف بوون ‹عروسیمان خورد به موشکباران: زەماوەنەکەمان خواردیە مووشەکبارانەکەوە› ١٥. واردەیوە؛ بە جێگەیێ گەیشتن یان تا ئەوێ درێژەدار بوون ‹این خیابان می‌خورد به میدان مرکزی: ئەم شەقامە نەخوانە مەیدانی ناوەندی›. هەروەها: **خوردنی**

■ صفت فاعلی: **خورنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **خورده** (خوراو)/ مصدرمنفی: **نَخوردن** (نەخواردن)

**خوردنی**[1] / xordanî ، ـها/:اسم. خواردەمەنی؛ خواردنی؛ واردەمەنی؛ وارده؛ چەرە؛ خۆرەن؛ پێخۆر؛ وەر؛ ئەوی وەک چێشت یان چەرە کە بۆ خواردن دەبێ ‹توی خانه هیچ خوردنی نداریم: هیچ خواردەمەنیمان لە مالدا نیە›.

**خوردنی**[2] / ـها/: صفت. خۆرەن؛ شیاوی خواردن؛ خاوەن چۆنیەتی خۆراکێکی باش ‹ناهار امروز اصلاً خوردنی نبود: فراوێنی ئەمرۆ هیچ خۆرەن نەبوو›.

**خوردوخوراک** / xord-o-xorāk/:اسم. [گفتاری] خورد و خۆراک؛ وارده و چەرە؛ پێخۆر؛ خواردەمەنی؛ چێشت ‹این پول به اندازه‌ی خوردوخوراک یک نفر هم نیست: ئەم پارە بەقەی خورد و خوراکی تاکە کەسێکیش نیە›.

⊡ **خوردوخوراک نداشتن**: ١. برس چوونە بەس؛ برس بەسیان؛ بەهۆی ناساقی لەش یان زەینەوە لە خواردن کەوتن ‹دو ماه خورد و خوراک نداشتم: دوو مانگ برسم چووبووە بەس› ٢. [نامتداول] بێ پێخۆر بوون.

**از خورد و خوراک افتادن**: لە خواردن کەوتن؛ بڕۆک بۆ خواردن نەمان ‹پاک از خوردوخوراک افتاده بود: تەواو لە خواردن کەوتبوو›.

**خورده** / xorde, xûrde/ ☜ **خُرده**

**ـ خورده** / xorde ، ـها/: پیواژه. ـخواردوو؛ ـلیداو؛ ـــ وارده؛ لێکەوتوو؛ وە بەر شتێ کەوتوو ‹شکست‌خورده؛ آفتاب‌خورده: شکست‌خواردوو؛ هەتاولیداو›.

**خورده‌برده** / xordeborde/:اسم. [گفتاری] ڕوودەربایسی؛ پەروا؛ پارێز ‹من با کسی خورده‌برده ندارم: من ڕوودەربایسیم لە کەس نیە›: **خُرده‌برده**

**خورسند** / xorsand/ ☜ **خُرسَند**

**خورسندی** / xorsandî/ ☜ **خُرسَندی**

**خورش** / xoreš ، ـها/:اسم. ١. خۆرش؛ خۆرشت؛ خوەرشت؛ مەرگە؛ ترشک؛ شلە؛ خۆرشتی گرار؛ شلە دەگەڵ گرار؛ پێخۆری کولاو؛ هەر یەکە لە پێخۆرگەلی لێندراوی کەم یا زۆر ئاودار کە زۆرتر دەگەڵ پلاودا دەخورێ: **خورشت**[گفتاری] ٢. [ادبی] خۆراک؛ خواردەمەنی؛ واردەمەنی؛ وارده؛ هەردە.

**خورشت** / xorešt/ ☜ **خورش ـ ١**

**خورشید** / xoršîd/:اسم. خۆر؛ خوەر؛ وەر؛ هۆر؛

وێره؛ ڕۆ؛ ڕۆژ؛ ڕۆژیار؛ ڕۆجیار؛ ڕۆچیار؛ تیرۆژک؛ تاو؛ تاف؛ هەتاو؛ هەتاف؛ ئافتاو؛ ئەفتەو؛ خوەرەتاو؛ ڕۆژی ئاسمان؛ ئەستێرەی خۆربەند کە لە ڕۆژانی بێهەوردا لە ئاسمانەوە دەدرەوشێ و سەرچاوەی ڕۆشنایی و تینی زەویە.

**خورشیدی** / xoršîdî/: *صفت.* هەتاوی؛ ڕۆژی؛ پێوەندیدار یان سەر بە خۆر ‹سال خورشیدی: سالی هەتاوی›.

**خورگرفت** / xorgereft ، ـها/: *اسم.* خۆرگیران؛ وەرگیریەی؛ دۆخی جێگرتنی گۆی مانگ لە نێوان زەوی و خۆردا.

**خورند** / xorand/: *صفت.* شیاو؛ لەباو؛ لەبار؛ دەرخۆر؛ ژهەژی؛ هەژ؛ هاوسان و بساز لەگەڵ شتێکدا و دەردخواردووی ئەو شتە ‹گرز باید خورند پهلوان باشد: گورز دەبێ شیاوی پاڵەوان بێ›.

**خورندگی** / xorandegî/: *اسم.* دارزاوی؛ خوراوی؛ تایبەتمەندی فیزیکی یان کیمیایی شتێ کە دەبێتە هۆی پوان و لە بەر یەک چوونی.

**خورنده** / xorande ، ـها/: *صفت.* دارزێنەر؛ داپەچقێنەر؛ داپەڕتێنەر؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی دارزاندنەوە ‹اسید مادەای خورندە است: ئەسید ماکێکی دارزێنەرە›.

**خوروپف** / xor(r)-o-pof/: *اسم.* پرخە؛ پرخەپرخ؛ خرپۆق؛ خرپە؛ مرخەمرخ.

**خوره** / xore/: *اسم.* گولی؛ گوڕی؛ نویرە؛ پیسی؛ کفت؛ شەقافلووس؛ پووتک؛ خیرک؛ خۆرە؛ جوزام؛ نەخۆشینی پێستی پەرەگر کە دەبێتە هۆی داکەوتنی لێو و کەپۆ و قامک.

◙ **خوره داشتن:** گول بوون؛ گیرۆدەی گولی بوون.

**خورەی کاری را داشتن:** *[مجازی]* سەر بۆ کارێ خوریان؛ سەر لە شتێ ئێشان؛ هۆگری کارێ بوون و شێلگیر بوون لە سەری: **کرم کاری را داشتن**

**خوره گرفتن:** گولی گرتن؛ گول بوون؛ پیسی گرتن؛ تووشی گولی هاتن؛ بە نەخۆشی خۆرە ئاوقان.

**خوزی** / xûzî/: *صفت.* خووزی: ١. سەر بە خووزستان ٢. ـها/ خەڵکی خووزستان.

**خوش**[1] / xoš/: *صفت.* خۆش؛ خوەش؛ وەش: ١. شاد؛ دڵپەسند ‹آن روز همه خوش بودیم: ئەو ڕۆژە هەموو خۆش بووین› ٢. *[ادبی]* چاک؛ باش؛ خاس؛ قەنج.

◙ **خوش به حالت:** *[گفتاری]* خۆزگە بە خۆت؛ خۆشی لە خۆت؛ خۆش بە دیارت؛ وەشڵەی پەنەت؛ خۆش بە حاڵت.

◙ **خوش آمدن:** خۆش هاتن؛ وەش ئامەی: ١. بە دڵ بوون؛ پەسند بوون؛ پێخۆش بوون؛ حەز لێبوون ‹از آن خانه خوشش آمد: لەو ماڵە خۆشی هات› ٢. بە خێر هاتن؛ هۆی خۆشحاڵ بوون؛ بوونە هۆی گەشانەوە ‹هر کس بیاید خوش آمده است: هەرکەس هات بە خێر بێ›.

**خوش بودن:** شا بوون؛ شاد بوون؛ خۆشحاڵ بوون؛ بەدەماخ بوون؛ کەیف ساز بوون؛ کەیف کۆک بوون؛ وەش بیەی.

**خوش داشتن:** پێخۆش بوون؛ حەز کردن؛ حەز لێ بوون؛ پنەوەش بیەی؛ هەرەک بوون؛ دڵ پێوە بوون ‹خوش دارم امروز تو را مهمان کنم: پێم خۆشە ئەمڕۆ میوانت کەم›.

**خوش کردن:** پێخۆش بوون؛ حەز کردن؛ واز لێ بوون؛ هەرەک بوون؛ گەرەک بوون؛ دڵ پێوە بوون؛ پنەوەش بیەی ‹خوش کردەام امشب باهم برویم گردش: پێم خۆشە ئەمشەو پێکەوە بچین بۆ گەڕیان›.

**خوش ـ**[2]: *پیشواژه.* خۆش ـ ؛ خوەش ـ ؛ وەش ـ ؛ خاس ـ ؛ چاک ـ ؛ باش ‹خوش‌آواز؛ خوش‌عطر: خۆش‌بێژ؛ خۆش بەرامە›.

**خوشا** / xošā/: *صوت.* چەن‌خۆشە؛ خۆشە؛

خۆشا؛ وەشا؛ وەشەن؛ خۆزگە؛ خۆزی؛ وەشڵەی؛ وەڕەکن؛ وەڕەکینا؛ وەڕەک؛ وەڕەکنا ‹خوشا شاهو و چشمەسارانش: چەن خۆشە شاهۆ و سەرچاوگەکانی›.

◙ **خوشا به حالت:** خۆزگە بە خۆت؛ خۆشی لە خۆت؛ وەشڵەی پنەت/ پەنەت؛ چەندە خۆشبەختی؛ چەند بەختیاری (بە کەسێک دەگوترێ کە بار و دۆخێکی خۆشی ببێ یان چاوەڕێی ڕووداوێکی خۆش بێ).

**خوشاب** / xošāb/: *اسم. [قدیمی]* ١. وەشاو؛ خۆشاو؛ خوەشاو؛ قەیسی و هەنجیر و مەویژ و... ئاوکراو ٢. کومپووت؛ میوەی هێندێک لە شەربەتدا کوڵاو.

**خوشامد** / xošāmad، ـها/: *اسم.* خۆشاتن: ١. بەخێراتن؛ خێر هێنان؛ بە خێر هاتن؛ خۆشهاتن؛ وەش‌ئامەی؛ وتەیێ کە بۆ پێشوازی‌کردن لە کەسێک ئەگوترێت ‹وزیر به مهمانان خوشامد گفت: وەزیر بەخێرهاتنی لە میوانەکان کرد› ٢. وتەیەک کە بۆ خۆشحاڵ کردنی دڵی کەسێک و ڕاکێشانی خۆشەویستی و سەرنجی دەگوترێ.

**خوشامدگویی** / xošāmadgûyî، ـها/: *اسم.* ١. کار و ڕەوتی خێراتن و خۆشاتن کردن؛ بە خێر هێنان، یان گوتنی زاراوە و ڕستەگەلی پێشوازی کردن لە کەسێک، وەک: خێرهاتن؛ وەش‌ئامەی؛ خۆشاتن بە نیشانەی پێخۆش بوون لە هاتنی ئەو کەسە ‹پس از خوشامدگویی، مهمانان به اتاقهایشان هدایت شدند: دوای بە خێرهێنان، میوانەکان ڕێنومایی کران بۆ دیوەکانیان› ٢. پێدا هەڵگوتن؛ کار یا ڕەوتی پێ‌هەڵگوتن؛ پێ‌هەڵدان ‹زیبایی خط شما یک واقعیت است و قصد خوشامدگویی ندارم: جوانی خەتی ئێوە بە ڕاستیە و من خەیاڵی پێداهەڵگوتنم نیە›.

**خوش‌اندام** / xošandām/: *صفت.* هنف؛ وەش‌ئەندام؛ بەژن‌ڕێک؛ بەژن لەبار.

**خوشایند** / xošāyand/: *صفت.* دڵخواز؛ دڵواز؛ خۆش؛ خوەش؛ وەش؛ بەردڵ؛ پێکەوتوو؛ پەسند؛ بەردڵ‌کەوتوو؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی دڵپەسەند و دڵخواز بوونەوە ‹رفتار خوشایند؛ منظرەی خوشایند: ئاکاری دڵخواز؛ دیمەنی خۆش›.

**خوشباش** / xošbāš، ـها/: *اسم. [ادبی]* شاواش؛ شاباش؛ پیرۆزبایی.

**خوشباور** / xošbāvar، ـها؛ ـان/: *صفت.* خۆشباوەڕ؛ وەشباوەڕ؛ دڵساف؛ بێ فێڵ و فەرەج؛ بە خوو یان تایبەتمەندی خۆشباوەڕی ‹مرا بگو که چقدر خوشباور هستم!: تۆ بزانە من چەند خۆشباوەڕم!›.

**خوشباوری** / xošbāvarî، ـها/: *اسم.* خۆشباوەڕی؛ وەشباوەری: ١. خوو یان تایبەتمەندیێک کە ئەبێتە هۆی ئەوە کەسێک قسە یان هەواڵی خۆش زوو باوەڕ بکا یان سەبارەت بەوانەوە، هەڵسەنگاندنێکی خۆشبینانەی هەبێ ٢. زووباوەڕی؛ کار یا ڕەوتی باوەڕ کردن بە قسەی مەردم بە بێ لێکۆڵینەوە.

**خوشبخت** / xošbaxt، ـها؛ ـان/: *صفت.* بەختەوەر؛ بەختیار؛ بەختدار؛ خۆشبەخت؛ وەشبەخت؛ خاوەن بەختیاری؛ بە بەخت؛ قیۆڵدار ‹مرد خوشبخت: پیاوی بەختەوەر›. هەروەها: **خوشبخت بودن؛ خوشبخت شدن؛ خوشبخت کردن**

**خوشبختانه** / xošbaxtāne/: *قید.* بەختەوەرانە؛ خۆشبەختانە؛ وەشبەختانە؛ بە خۆشیەوە؛ وشەیەکە بۆ پیشاندانی چاکی ڕووداوێک بە کار ئەبرێ ‹خوشبختانه امسال محصول گندم خوب بود: خۆشبەختانە ئەوساڵ داهاتی گەنم چاک بوو›.

**خوشبختی** / xošbaxtî، ـها/: *اسم.* خۆشبەختی؛ وەشبەختی؛ بەختەوەری؛ بەختیاری؛ بەختداری؛ خۆش‌نگینی؛ دۆخی هەبوونی ژیانی دڵخواز و پڕخۆشی ‹ثروت خوشبختی نمی‌آورد: ماڵ، خۆشبەختی ناهێنێ›.

**خوشبین** / xošbîn، ـها؛ ـان/: *صفت.* گەشبین؛

خۆشبین؛ چاکبین؛ دڵڕوون؛ هزرباش؛ وەشوین؛ هەر بە هومێد؛ دوور لە ناهومێدی؛ خاوەن خۆشبینی ‹بە آینده خوشبین هستم: بە داهاتوو خۆشبینم›.

**خوشبینی** / xošbînî، ـها/: اسم. گەشبینی؛ خۆشبینی؛ وەشوینی: ١. باوەڕ بە چاک بوونی دیاردەیەک، ڕووداوێک یان کەسێک ٢. باوەڕ بە چاک بوونی ڕووداوەکان و لە گەشە بوونی جەهان و هیواداری بە داهاتوو ‹خوشبینی به آینده از اعتماد بشریت و تواناییهای آن سرچشمه میگیرد: خۆشبینی بە داهاتوو لە باوەڕ بە مرۆڤایەتی و تواناییەکانی سەرچاوە دەگرێ›.

**خوش پز** / xošpoz/: [فارسی/ فرانسوی] صفت. [گفتاری] تەکووز؛ قۆز؛ وەشدوخت؛ خاوەن جل و بەرگ و ئارایشی جوان و دڵخواز.

**خوشپوش** / xošpûš، ـها؛ ـان/: صفت. پۆشتە: ١. کۆک؛ جلکتازە؛ تەڕپۆش؛ خۆشپۆش؛ پۆشتە و پەرداخ ‹یک جوان خیلی خوشپوش راهنمایی ما را برعهده داشت: لاوێکی زۆر پۆشتە ڕێنوێنی ئێمەی بە ئەستۆ بوو› ٢. بە خوو و توانای لە بەرکردنی گنجی شیاو و جوانەوە ‹آزاد مرد خوشپوشی بود: ئازاد پیاوێکی پۆشتە بوو›. هەروەها: **خوشپوشی**

**خوشتراش** / xoštarāš/: صفت. لەبار؛ ڕێکوپێک: ١. باش تاشراو ‹مجسمەی خوشتراش: پەیکەری باشتاشراو› ٢. جوان و چەلەنگ؛ خوشیک ‹هیکل خوشتراش: تووزی ڕێکوپێک›.

**خوش تیپ** / xoštîp/: [فارسی/ فرانسوی] صفت. نەرمەنیشک؛ جوانخاس؛ جوان؛ خوشیک؛ وەشەک؛ خاوەن ئەندامی ڕێکوپێک و ڕازاوە ‹خیلی خوشتیپ شده بود: زۆر نەرمەنیشک بووبوو›. هەروەها: **خوش تیپی**

**خوش جنس** / xošcens/: [فارسی/ عربی] صفت. ١. ڕگەز چاک؛ بە کالەدەندی باشەوە ٢. [کنایی] دڵاوەر؛ دڵهاوەر؛ باش ‹مدیرمان خوشجنس است و بیخود سخت نمیگیرد: بەرپرسەکەمان، دڵاوەرە و لە خۆوە بەرۆکمان ناگرێ›. هەروەها: **خوش جنسی**

**خوشحال** / xošhāl/: [فارسی/ عربی] صفت. خۆشحاڵ؛ وەشحاڵ؛ پەرداخ؛ شاد؛ شادمان؛ بەدەماخ؛ وەکەیف.

▣ **خوشحال شدن**: خۆشحاڵ بوون؛ دڵشاد بوون؛ شاد بوون؛ وەشحاڵ بیەی ‹از دیدنت خیلی خوشحال شدم: لە دیتنت زۆر خۆشحاڵ بووم›. هەروەها: **خوشحال کردن**

**خوشحالی** / xošhālî/: [فارسی/ عربی] اسم. [گفتاری] خۆشحاڵی؛ وەشحاڵی؛ خۆشدەماخی؛ بە کەیفی؛ خوەشڵەخوەشی؛ دڵشادی؛ شادی؛ هەڤەس.

▣ **خوشحالی داشتن**: شیاوی خۆشحاڵ بوون؛ گونجاو بۆ شاد بوون ‹موفقیت، خوشحالی دارد: سەرکەوتن، شیاوی خۆشحاڵ بوونە›.

**خوشحالی کردن**: شایی کردن؛ خۆشحاڵی کردن؛ خەریکی شایی بوون ‹همه دست میزدند و خوشحالی میکردند: هەموو چەپڵەیان دەکوتا و شاییان دەکرد›.

**خوش حساب** / xošhesāb، ـها/: [فارسی/ عربی] صفت. حەساب ڕاست؛ سەرڕاست؛ خۆش حەساو؛ خۆش/ وەش حەسێب؛ خاوەن خوو یان تایبەتمەندی قەرز دانەوە لە سەر وەختدا ‹مشتریهای ما همه خوشحساب هستند: مشتەریانی ئێمە هەموو حەسابڕاستن›. هەروەها: **خوش حسابی**

**خوش خبر** / xošxabar/: [فارسی/ عربی] صفت. خۆشخەبەر؛ خۆشخەوەر؛ مژدەهێن؛ مزگێنیدەر: ١. خاوەن هەواڵی خۆش ‹خوشخبر باشی! چه شده؟: خۆشخەبەر بی! چ بووە؟› ٢. خاوەن خوو یان توانایی هێنانی هەواڵی خۆش ‹تو همیشه خوشخبر هستی: تۆ هەمیشە خۆشخەبەری›. هەروەها: **خوش خبری**

**خوشخدمتی** / xošxedmatî، ـها/: [فارسی/

عربی]/سم. خۆش‌خزمەتی؛ کار یان ڕەوتی خزمەت‌کردن، زیاتر لەوەی کە پێویستە، تەنیا بۆ سەرنج ڕاکێشانی کەسێک و قازانج لێ وەرگرتنی ‹آنقدر خوشخدمتی کرد تا وزیر شد: ئەوەندە خۆش‌خزمەتی کرد، بوو بە وەزیر›.

**خوشخرام** / xošxarām/: *صفت. [ادبی]* خەرامان؛ چەلەنگ؛ لەنجەجوان؛ بە لەنجە و لار؛ خۆش‌گومەتە؛ خۆش‌خلنگ.

**خوشخواب** / xošxāb/: *صفت.* ۱. خەوخۆش؛ خۆش‌خەو؛ خەو-خەو؛ بە خوو یان لێهاتوویی چاک و هاسان خەوتنەوە ۲. ☜ تشک خوشخواب، **تشک**

**خوشخوان** / xošxān ، ـها/: *صفت.* دەنگ‌خۆش؛ دەنگ‌بێژ؛ خۆش‌بێژ؛ خۆشاواز؛ خۆش‌خوێن؛ وەشواچ؛ وەشوان ‹گر خوش‌آواز بودی و خوشخوان: ئەگەر دەنگ‌خۆشیش بووبایە›.

**خوش‌خوراک** / xošxorāk/: *صفت.* ۱. خۆش‌خۆر؛ خواردە؛ خوەش‌خەوەر؛ وەشەوەر؛ خاوەن بژۆکی باش ‹بچەها همە خوش‌خوراک هستند و هیچ وقت غذا از سر سفره بر نمی‌گردد: منداڵەکان هەموو خۆش‌خۆرن و هیچ کاتێ چێشت لە سەر خوان ناگەڕێتەوە› ۲. *الف)* خۆش‌چێشکە؛ خاوەن چێژەی باش *ب)* خوازیاری خواردەمەنی خۆش و بە سەلیقە لە هەڵبژاردنیاندا ۳. خۆش‌خوراک؛ شیاو بۆ دروست کردنی پێخۆری چاک ‹این برنج خیلی خوش‌خوراک است: ئەم برینجە، زۆر خۆش‌خوراکە›.

**خوش‌خوشان** / xošxošān/: *صفت. [گفتاری]* شاگەشکە؛ خۆش ـ خۆش؛ لە سەر شادی و شادمانی زۆر ‹عروس گریه می‌کرد و مادر خوش‌خوشانش بود: بووک دەگریا و دایک شاگەشکەی دەکرد›.

**خوش‌خوشک** / xošxošak/: *قید.* نەرمەنەرم؛ بە نەرمێک؛ لۆژەلۆژ؛ بە هێمنی؛ بە ئارامی؛ لەسەرخۆ؛ وردە- وردە؛ ئارام- ئارام؛ گۆڤا-گۆڤا؛ هێدی- هێدی؛ وەش-وەش؛ شێنەشێنەی؛ شێنەی؛ بە هێوری ‹خوش‌خوشک رفتند تا نزدیک ظهر به آبشار شەلماش رسیدند: نەرمەنەرم ڕۆیشتن و دەوری نیوەڕۆ گەیشتنە تاقگەی شەڵماش›.

**خوش‌خیال** / xošxiyāl ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت. [مجازی]* خۆش‌خەیاڵ؛ خاوەن گەشبینی لە ڕادەبەدەر و نابەجێ ‹من چقدر خوش‌خیال بودم که به امید تو ماندم: من چەندە خۆش‌خەیاڵ بووم وا بە هیوای تۆ مامەوە›. هەروەها: **خوش‌خیالی**

**خوش‌خیم** / xošxîm/: *صفت.* خۆش‌هێم؛ خۆش‌خوو؛ بێ‌گرێ؛ بێ کارتێکەری یان کاردانەوەی زیاندەر یان مەترسیدار ‹غدەی خوش‌خیم: لکی خوش‌هیم›.

**خوش دست** / xošdast/: *صفت.* خۆشدەست؛ خوەشدەس؛ وەشدەس؛ هولی؛ خاوەن دۆخ یان چۆنیەتیەکی وا کە بە هاسانی لە دەستدا بخونجێ و بە کار بگیردرێ ‹ارەی خوش‌دست: هەڕەی خۆشدەست›.

**خوشدل** / xošdel/: *صفت.* ۱. دڵشاد؛ دڵخۆش؛ شاد؛ دەماخ‌چاخ ۲. ڕازی؛ ڕەزامەند؛ قایل؛ قادێ. هەروەها: **خوشدلی**

**خوش‌ذوق** / xošzowq, -zo:q ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بەزەوق؛ بە سەلیقە؛ خۆش‌چێژ؛ خاوەن هێز و زۆخی نوێکاری.

**خوشرقصی** / xošraqsî ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*سم. [تعریض]* کلکەفلێ؛ کلکەلەقێ؛ جووچکەلەقێ؛ کلکەسووتە؛ کار و کردەوەی زمانلووسانە و بە مەرایی بۆ بە دەسهێنانی دڵی کەسێک و قازانج لێ‌وەرگرتنی ‹کارش شده است خوشرقصی پیش معلمها: کاری بۆتە کلکەلەقێ لای مامۆستایان›. هەروەها: **خوش‌رقصی**

**خوش رکاب** / xošrekāb/: [فارسی/ عربی] *صفت.* خۆش‌زەنگوو؛ خوەش‌سواری؛ وەش‌وەزنگی؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی چاک سواری دانەوە ‹اسب خوش‌رکاب: ئەسپی خۆش‌زەنگوو›.

**خوشــــرو** / xošrow/: صـفت. خۆشـــبەز؛ بـــەزا؛ نەوەن؛ شاتر؛ قۆچــاخ؛ گــورجوگــۆڵ؛ کرژوکــۆڵ؛ چوست و چەلەنگ؛ بزۆز؛ برۆ؛ کرژ؛ لۆپت؛ لۆتەر؛ خێرا لە ڕۆیشتندا.

**خوشرو** / xošrû ، ـها؛ ـیان/: صفت. ڕووخـۆش؛ خۆشـــڕوو؛ ڕووگـــەش؛ ڕووگوشـــاو؛ ڕووگوشـــاد؛ ڕووکراوە؛ لــەزگین؛ وەشــڕوو(نێرینــە)؛ وەشــڕوە (مێینــە)؛ دەم بــە پێکــەنین ‹یـک آقـای مـؤدب و خوشرو جلو آمد: پیاوێکی بە ئەدەب و ڕووخۆش هاتــە پێشەوە›. هەروەها: **خوشرویی**

**خوش‌زبان** / xošzabān ، ـها/: صفت. [مجازی] قـــسەخۆش؛ خـــۆش‌زمـــان؛ خـــوەش‌زوان؛ زمان‌خۆش؛ شیرین‌زمان؛ خۆش‌دەڤ؛ دەم‌پـاراو؛ خۆش‌گفت؛ خاوەن وتاری خۆش و دڵڕفێن یـان پاراو ‹راهنمایمان مردی خوش‌زبان بود: ڕێنوماکـەمان پیاوێکی قسەخۆش بوو›.

**خوشقدم** / xošqadam/: [فارسـی/ عربـی] صفت. [فرهنگ‌مردم] خۆشقەدەم؛ پێ‌بەوەدم؛ پێ و قەدەم چاک ‹بچه خوشقدم بود و بعد از آمدنش کـار و بـار مـا خوب شد: منداڵەکە پێ‌بەوەدم بوو و دوای هاتنی، کـار و بارمان باش بوو›.

**خوش‌قلــب** / xošqalb/: [فارسـی/ عربـی] صفت. [مجازی] دڵپاک؛ دڵخوازیار؛ خۆشدڵ؛ خوازیـاری خۆشی هەمووان ‹سارا خیلـی خـوش‌قلـب و مهربـان اسـت: سـارا زۆر دڵـپاک و میهرەبانـە›. هـەروەها: **خوش‌قلبی**

**خوش‌قواره** / xošqavāre/: [فارسـی/ عربـی] صفت. لەبار: ١. بە درێژایی، پانایی و بیچمی لەباو ‹این فرش خیلی خوش‌قواره است: ئـەم قاڵـیە زۆر لــەبارە› ٢. تــەکووز؛ قـــەنج؛ خـــاوەن لـــەباری ‹لبـاس خوش‌قواره: گنجی لەبار›.

**خوش‌قول** / xošqowl, -qo:l/: [فارسـی/ عربـی] صفت. خۆش‌بەڵـێن؛ بـە بەڵـێن؛ بەڵـێن‌ڕاسـت؛ دەم‌ڕاس؛ خـاوەن خـوو یـان بـە دوا چـوون لـە ئەنجامدانی گفت و پەیمانی خـۆدا ‹امروز دیگـر سعی کردم خوش‌قول باشم و سر وقت آمدم: ئەمڕۆ ئیتر وامکرد خوش‌بەڵێن بم و لـە کـاتی خۆیـدا هـاتم›. هەروەها: **خوش‌قولی**

**خوشگذران** / xošgozarān/: صـفت. خۆشـبوێر؛ خـوش‌ڕابـوێر؛ وەشـبەر؛ وەش‌ویـار؛ خوازیـاری ڕابـــواردن بـــە سەرخۆشـــی و بـــێ‌خـــەمی و بێ‌خەبەری ‹چند جوان خوشگذران، روزهای جمعـه در آن باغ جمع می‌شـدند: چەنـد لاوی خۆشـبوێر ڕۆژانی هەینی لەو باخەدا کۆ دەبوونەوە›.

**خوشـــگذرانی** / xošgozarānî ، ـهـا/: اسم. خـــۆش‌بـــوێری؛ خـــۆش ڕابـــوێری؛ وەشـــبەری؛ وەش‌ویاری؛ خۆشگوزەرانی؛ فرەهـی؛ کـار یـان ڕەوتی خۆش‌بووران؛ خۆش ڕابواردن؛ تێپەڕاندنی سات و دەم بە خۆشـی و شـادی یـان دڵـتەڕی ‹ارث پدر را خرج خوشگذرانی خودش و دوستانش کـرد: میراتی باوکی کردە خەرجی خـوش‌بـوێری خـۆی و هەوالانی›.

**خوشگل** / xošgel ، ـها/: صفت. [گفتاری] جـوان؛ خوشـــیک؛ خوشـــکۆک؛ ســـپەهی؛ جوانکیلـــە؛ ماژەخاس ‹دختر خوشـگل؛ ماشـین خوشـگل: کچـی جوان؛ ماشینی جوان›. هەروەها: **خوشگل بـودن؛ خوشگل شدن؛ خوشگل کردن**

**خوشـــگلی** / xošgelî/: اسم. [گفتـاری] جـوانی؛ خوشیکی؛ جوانکیلـەیی ‹خوشـگلی زنـش، موجـب دردسـرش شـده بـود: جـوانی ژنەکـەی ببـووە هـۆی دەردیسەر بۆی›.

**خوش گوشت**[1] / xošgûšt/: اسم. خۆشەگۆشـت؛ گۆشتەخوەشە؛ کەبابی شیلافەی مەڕ و شەک.

**خـــوش گوشـــت**[2]: صــفت. خـــۆش‌گۆشـــت؛ گۆشت‌خۆش: ١. خاوەن گۆشتی بـەتام و چێـژ ‹کبک پرندەای خوش‌گوشت اسـت: کـەو پەلـەوەرێکی خوش‌گوشته› ٢. گۆشتەزوونە؛ خاوەن گۆشتی وا کە ئەگەر زامدار بوو، زوو خۆش بێتەوە.

**خوشمزگی** / xošmaz(z)egî/: اسم. ١. خۆشـی؛ چێژخۆشـــی؛ وەشـــی؛ بەلـــەزەتی؛ خۆشـــتامی؛

بەتامی؛ تامداری ‹خوشمزگی سالاد به خاطر سُس آن است: خۆشی سالاد بە بۆنەی سوسەکەیەوەیە› ٢. لـھا//مجازی/ شیرینکاری؛ حەنەکبازی؛ گۆنگەری ‹داشت برای مهمانان، خوشمزگی می‌کرد: خەریک بوو بۆ میوانەکان شیرین‌کاری دەکرد›.

**خوشمزه** / xošmaz(z)e/: صفت. ١. خۆشمەزە؛ خۆش‌چێژە؛ خوەش‌مژە؛ بەتام؛ بەلەزەت ‹غذای خوشمزه: چێشتی خوشمەزە› ٢. /مجازی، گفتاری/ خۆش؛ شۆخ ‹آدم خوشمزه؛ داستان خوشمزه: مرۆی شوخ؛ چیرۆکی خوش›.

**خوشنام** / xošnām ، ـھا/: صفت. خۆشناو؛ وەشنام؛ ناو بە چاکە دەرچووگ ‹سعی کردند یک آدم خوشنام را جلو بیندازند: تێکۆشان، مرۆڤێکی خوشناو بخەنە پێشەوە›. هەروەها: **خوشنام بودن**

**خوشنامی** / xošnāmî/: اسم. خۆشناوی؛ وەشنامی؛ ناوچاکی؛ سەخەر؛ چۆنیەتی ناو دەرکردن و ناسراو بوون بە چاکە لە ناو خەڵکدا ‹او نزد مردم به خوشنامی معروف بود: ئەو لە ناو خەڵکدا بە خوشناوی ناسرابوو›.

**خوش‌نشین** / xošnešîn ، ـھا/: اسم. ١. ڕەشایی؛ قەرە؛ خۆش‌نشین؛ گوندنشینی بێ ماڵ و زەوی ٢. وەرزێر؛ وەرزیەر؛ وەرزیار ٣. کەسێ کە هەر کوێ دڵی بگرێ و خۆشی لێ بێ، نیشتەجێ دەبێ ‹اجارەنشین، خوش‌نشین است: کرێنشین، خوش‌نشینە›. هەروەها **خوش‌نشینی**

**خوش‌نمک** / xošnamak/: صفت. خۆش‌خوێ؛ خوەش‌خوا؛ وەش‌مەک؛ بە چێژی سوێری دڵخوازەوە.

**خوشنود** / xošnûd/ ☜ **خُشنود**

**خوشنودی** / xošnûdî/ ☜ **خُشنود**

**خوشنویس** / xošnevîs ، ـھا؛ ـان/: صفت. خۆش‌نووس؛ خۆش‌نڤیس؛ وەش‌نویس؛ خەتات؛ خاوەن خەتی جوان و ڕازاوە.

**خوشنویسی** / xošnevîsî ، ـھا/: اسم. خەتاتی؛ خۆش‌نووسی؛ خۆش‌نڤیسی؛ گوندەنووسی؛ هونەری نووسین بە جوانی.

**خوش‌وبش** / xoš-o-beš ، ـھا/: اسم. /گفتاری/ چاک و خۆشی؛ چاک‌وچۆنی؛ خۆشتەوازی؛ وەش‌بەش؛ وەش و تشی؛ خوەش و بێش؛ خۆش و بێش؛ خۆش و دۆش؛ سلام و سەفا، چاک و چۆنی و وت‌وویژی دۆستانە لە سەرەتای دیداردا ‹قدری با هم خوش و بش کردیم: تاوێک پێکەوە چاک و خوشیمان کرد›.

**خوشوقت** / xošvaqt/: [فارسی/ عربی] صفت. خۆشحاڵ؛ شاد؛ خۆش‌دەماخ ‹از دیدار شما خیلی خوشوقت شدم: لە دیتنی ئێوە زۆر خوشحال بووم›. هەروەها: **خوشوقتی**

**خوشه** / xûše/: اسم. ١. لـھا/ هێشوو؛ هۆشە؛ هێشی؛ هۆشی؛ ئویشی؛ وشوو؛ وشی؛ ویشی؛ وەشەی؛ گۆشە؛ بۆڵ؛ چەند دانە، بەر یان گوڵێک کە بە تەوەرەیەکەوە گلاون (وەک هێشووی ترێ) ٢. لـھا//مجازی/ هەر شتێکی وەک هێشوو ٣. /نجوم/ کۆمە؛ تاقمێ لە ئەستێران کە لە یەک ڕێگە و بە خێراییەکەوە دەڕۆن ٤. /نجوم/ سومبولە؛ وێنەیەکی ئاسمانی گەورەیە: **سنبله**

◙ **خوشەی پروین** ☜ **پَروین**

خوشەی مرکب: هۆشەڵوو؛ جۆرێ گوڵی بە لق و پۆپ.

**خوشەچین** / xûšečîn ، ـھا؛ ـان/: اسم. ١. هێشووگەر؛ هێشووکەر؛ وشووکەر؛ لەتەچن؛ ویشی‌چن؛ داشی؛ قورف؛ گوڵچن؛ کەسێ کە بەجێماو لە خەرمان کۆ دەکاتەوە ٢. /کنایی/ گوڵبژێر؛ گوڵچن؛ تەڵبژێر؛ ئەوەی کە لە هەرکوێ و هەر شتێک بەهرە و تۆشەیەک وە دەس دەخا. هەروەها: **خوشەچینی**

**خوشی** / xošî ، ـھا/: اسم. خۆشی؛ خوەشی؛ وەشی؛ وەشەی؛ شادی؛ دڵشادی؛ کەیف؛ شۆق؛ هەون؛ زەوق.

◙ خوشی زیر دل کسی زدن: /گفتاری/ سەری

کەسێ بە گاز گیران؛ لە خۆشیدا هار بوون؛ قەدری ئاسایشت و ئاسوودەیی نەزانین و کرد و کۆش بۆ تێکەوەدانی ‹مگر خوشی زیر دلت زده، که می‌خواهی این کار را ول کنی؟: مەگەر سەرت بە گاز گیراوە، دەتەوێ دەس لەم کارە بەر دەی؟›.

**خوش‌یمن** / xošyomn/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[گفتاری]* بەودم؛ بە هورم؛ هورمێن؛ بەفەڕ؛ هۆی ڕووداو و کاردانەوەی باش ‹دیدن اسب در خواب خوش‌یمن است: دیتنی ئەسپ لە خەودا بەودمە›.

**خوش‌یمنی** / xošyomnî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* *[گفتاری]* هورمێنی؛ بەودمی؛ بەفەڕی ‹هر چه از خوش‌یمنی این خانه بگویم، کم گفته‌ام: هەر چەند لە هورمێنی ئەم ماڵە بێژم، کەمە›.

**خوض** / xowz/: [عربی] *اسم. [ادبی]* هشان؛ کنە؛ بیرقووڵی؛ وردبینی.

▣ **خوض کردن:** هشاندن؛ کنەکردن؛ ورد بوونەوە؛ تێڕامان؛ تێفکرین؛ لەبارەی شتێکەوە باش- باش کۆڵینەوە.

**خوف** / xowf/: [عربی] *اسم.* ترس؛ سام؛ ساو؛ سامی؛ یاس؛ مەترسی؛ تەرسی؛ سوهن؛ بیم.

▣ **خوف داشتن:** ترس بوون؛ ترسان؛ ترسیان؛ تەرس بیەی ‹خیلی از تاریکی خوف داشت: زۆری ترس لە تاریکی بوو›.

**خوف کردن:** ترسان؛ ترسین؛ سام کردن؛ سام‌کەردەی ‹خوف نکن! چیزی نیست؛ دارند تمرین می‌کنند: مەترسە! هیچ نیە؛ خەریکن مەشق دەکەن›.

**خوفناک** / xowfnāk/: [عربی/ فارسی] *صفت.* سامناک؛ ترسناک؛ زەرەند؛ بەسام؛ بە مەترسی؛ خۆفناک؛ سامدار ‹توی غار خیلی خوفناک بود: نێو ئەشکەوتەکە زۆر سامناک بوو›.

**خوف‌ورجا** / xowf-o-racā/: [عربی] *اسم. [ادبی]* هات‌ونەهات؛ ترس و تکا؛ ترس و تەما ‹ما را میان خوف و رجا نگه‌داشته بود: ئێمەی لە سەر هات‌ونەهاتدا هێشتبووەوە›.

**خوک** / xûk/: *اسم.* ۱. ـها؛ ـان/ بەراز؛ وەراز؛ وراز؛ خووگ؛ خوو؛ خیگ؛ واش؛ گاکوڵ؛ گیانەوەرێکی گوهانداری بێ‌شاخە بە لمبۆزێکی درێژ و بزۆکەوە، شفرەدار، جەستە قورس، چوارپەل کورت، پێست تۆکمە و تیسکن کە لە زۆر وڵاتان بۆ گۆشت و چەوری و پێست و تووکەکەی دایدەبەستن ۲. دوازدەهەمین ساڵی ڕۆژ ژمێری تورکستانی ☜ **تقویم** (تقویم ترکستانی).

▣ **خوک خاکی** ☜ **آردْوارک**

**خوک دریایی** ☜ **دُلفین-۲**

**خوک گینه** ☜ خوکچەی هندی، **خوکچه**

**خوک وحشی** ☜ **گُراز-۲**

**خوکچه** / xûkče، ـها/: *اسم.* ۱. بەرازی چکۆلە؛ خووی بچووک ۲. کۆدە؛ کودەڵە؛ کوودەڵە؛ کودی؛ بەچکە بەراز.

▣ **خوکچەی هندی:** گیانەوەرێکی گوهانداری چکۆلەی وڵاتی ئامریکای باشووریە، بێ‌کلک و کولکنە و جەستەیێکی گۆشتنی هەیە. بە سانایی کەوی دەبێ و لە تاقیگەی ژینەوەرناسیدا کەڵکی لێ‌وەردەگرن: **خوک گینه**

**خوکدانی** / xûkdānî، ـها/: *اسم.* ۱. تەویلەی بەراز؛ گەوڕی بەرازان ۲. *[مجازی]* کولانە سەگ؛ گەوڕ؛ جاتاکانی؛ جێگەی زۆر پیس و ناشیاو بۆ ژیان ‹تو اسم این خوکدانی را گذاشته‌ای اتاق؟: تۆ ناوی ئەم کولانە سەگەت ناوە وەتاغ؟›.

**خوکک** / xûkak/: *اسم.* ملەماسێ؛ ملەخڕە؛ ئوریون؛ نەخۆشی پەنەمیانی لووی بن گوێ.

**خوگر** / xûgar/: *صفت.* خووگر؛ هوکارە بە شتێک. هەروەها: **خوگر بودن؛ خوگر شدن**

**خوگیر** / xûgîr/ ☜ **خوگَر**

**خولنجان** / xûlancān، ـها/: *اسم.* خۆلنجان؛ کۆلنجان؛ قۆریجان؛ قۆلنجان؛ قۆلیجان؛ قۆرینگان؛ خرندال؛ گیایێکی بە ڕەنگی سووری تۆخ و بۆنی توند و خۆشە، بەلەق و لاسکی

هێشووییەوە بۆ دەرمان دەشێ.

**خـون / xûn/:** /اسم/. خـوێن؛ خـوون؛ خـوین؛ خـووین؛ خـوەن؛ خـێن؛ خـین؛ هـوون؛ هـۆن؛ هـوین؛ ونی؛ ون؛ گـۆن؛ گـۆنی: ۱. تراوێکـی سوورە، دڵ و دەماری بڕبڕەداران پـڕ دەکاتـەوە، ئۆکسیژن و ماکی خۆراکی دەگەیێنێتە ئەندامان و مـاکی زیـادە و زبـڵیان لێـوە دوور دەخاتـەوە ۲. تراوێکـی کـەم تـا زۆر بـەو شـێوەیە لـە بێمۆرەکاندا ۳. /ها//مجازی/ کوشـتوبـڕ ‹خـون ناحق: خوێـنی ناحەق›.

▣ **خون ناحق:** /کنایی/ خوێنی ناحـەق؛ کوشـتن بە نارەوا.

▣ **خون آمدن:** خوێن لێهاتن؛ خوێن هـاتن؛ ون ئامەی ‹چاقو دستم را بریـد، خـون امـد: چەقۆکـە دەسمی بڕی، خوێنی لێهات›.

**خون از انگشتان/ دست کسی چکیدن:** /کنایی/ خوێن لە چاوانی کەسێک بارین؛ زۆر بێبـەزە و دڵڕەق بوون.

**خون از دماغ کسی نیامدن:** /کنایی/ نـاخوونی کەس ڕووش نەبوون؛ خوێن لە لـووتی کـەس نـەهاتن؛ بـە کەسـێ کـەمترین وەزەنـگ نەگەیشتن ‹با اینکه ماشـین دوتـا معلق زد، حتـی خون از دماغ کسی نیامد: هەرچەنـد ماشـینەکە دوو تلی دا، تەنانەت ناخوونی کەس ڕووش نەبوو›.

**خون از صورت کسی چکیدن:** /کنایی/ سـەر کولمی کەسێک سـوور بـوون؛ ئـاو زانـە ژێـر پێستی کەسێکەوە؛ بە دەماخ بوونی کەسێ.

**خـون انـداختن:** خوێنالـی کـردن؛ خوێنـاوڵ کردن؛ ونالین کـەردەی؛ بوونـە هـۆی خـوێن هـاتن ‹زد و دمـاغش را خـون انـداخت: لێـی دا و لووتی خوێنالی کرد›.

**خـون بـالا آوردن:** خـوێن ڕشـانەوە؛ خـوێن هەلاوردنەوە؛ ون هۆرئاردەیوە.

**خـون بنـد آمـدن:** خـوێن وێـسانەوە؛ خـوێن گرسانەوە؛ ون مـدرایوە؛ وێـستانی خـوێن لـە ئەندامی بریندار‌دا.

**خون به پا کردن:** ئاور دایـساندن؛ شـەڕ بـەرپا کردن؛ شەڕی سەخت و خوێنین هەڵـخڕاندن ‹آرام باش! چرا می‌خواهی خون به پا کنی؟: دامرکێ! بۆ دەتەوێ ناور دایسێنی؟›.

**خون به دل کـسی کـردن:** /مجـازی/ داخ نانـە سـەر دڵـی کەسـێکەوە؛ زووخـاو بـە کەسـێ هەڵـێنان؛ زۆر ئـازار دان و پەرێـشان کـردنی کەسێک ‹با این کارهایت خون به دل ما مـی‌کنـی: بەم کارانـەت داخ دەنێتـە سـەر دڵـمانەوە›: **دل کسی را خون کردن**

**خـون جگـر/ دل خـوردن:** /مجـازی/ زووخـاو هەڵهاوردنەوە؛ ناراو چەشتن؛ کوڵ و کەسەری زۆر دیتن ‹خـون جگـر خـوردم تـا بزرگـت کـردم: زووخاوم هەڵهاوردەوە تا گەورەتم کرد›.

**خـون جلـو چـشم کـسی را گـرفتن:** /مجـازی/ خوێن پەڕینە بەر چاوی کەسێک؛ خوێن بـەر چاو کەسێ‌گرتن؛ ئـاگر لـە نـاو چـاو کەسـێ بارین؛ دین لای کەسێ نەمان؛ بە هـۆی ڕق و قینەوە ویستی کوشتنی کەسێ کـردن ‹خـون جلو چشمش را گرفتـه بـود و حـرف کـسی را گـوش نمی‌کرد: خوین پەریبووە بەرچاوی و گوێچکەی بە قسەی کەس نەدەدا›: **جلو چشم کسی را خـون گرفتن**

**خون خود را کثیـف کـردن:** /مجـازی/ تـووڕە بوون؛ قەڵس بوون.

**خون، خون کـسی را خـوردن:** /مجـازی/ خـۆ خواردنەوە؛ یـەکجار تـووڕە و قەڵـس بـوون و دەنـگ نـەکردن ‹از حرفهـایش خـون، خـونم را می‌خورد: لە قسەکانی خۆم دەخواردەوە›.

**خـون دادن:** ۱. خـوێن دان؛ ون دەی ‹همـه رفتیم خون بـدهیم: هـەمووومان ڕۆیـشتین خـوێن بدەین› ۲. /کنایی/ گیان بەخت‌کردن؛ لە گیان بگەردن.

**خون را با خون شستن:** /مجازی/ تۆڵەی خـوێن

به خوێن‌کردنەوە؛ تۆڵەی کوژرانی کەسێک بە کوشتنەوە گرتن ‹خون را که نباید با خون شست: نابێ تۆڵەی خوێن بە خوێن بکرێتەوە›.

**خون را بند آوردن:** بەر خوێن گرتن؛ خوێن بەست‌کردن؛ زەمتاندن؛ ون مدرنایوە؛ بەر خوێن‌چوون لە ئەندامێکی بریندار گرتن ‹رگش را بست و خون را بند آورد: ڕەگەکەی بەست و بەر خوێنەکەی گرت›. هەروەها: **خون بند آمدن**

**خون را ه افتادن:** *[کنایی]* خوێن ڕژان؛ ون کریەی؛ کوشت‌وبڕ ڕوو دان ‹گفتم حالا خون راه می‌افتد: گوتم ئێستا خوێن دەرژێ›.

**خون راه انداختن:** *[کنایی]* کردنە کوشت‌وبڕ؛ قەڵت و بڕ نانەوە ‹چیزی نمانده بود خون راه بیاندازد: شتێکی نەمابوو بیکاتە کوشت‌وبڕ›.

**خون رفتن:** خوێن لێ چوون؛ خوێنڕێژی کردن؛ ون چنە لوەی ‹تا به بیمارستان رسید، یک ربع از بدنش خون رفت: تا گەیشتە نەخۆشخانە چارەکێک خوێنی لێ چوو›.

**خون ریختن:** *[کنایی]* خوێن ڕژاندن؛ ون متەی؛ کوشت‌وبڕکردن ‹چه خونها ریختند: چ خوێنگەلێکیان ڕژاند›.

**خون کردن:** کەسێ کوشتن؛ پیاو کوشتن؛ ون‌کەردەی ‹چرا بترسم؟ مگر خون کرده‌ام؟: بۆ بترسم؟ مەگەر کەسێکم کوشتووە؟›.

**خون کسی رنگین‌تر بودن:** *[مجازی]* چاوی کەسێ ڕەشتر بوون؛ خوێنی کەسێ سوورتر بوون ‹مگر خون تو رنگین‌تر است؟: مەگەر چاوی تۆ ڕەشترە؟›.

**خون کسی به‌جوش آمدن:** *[مجازی]* چاوی کەسێ پەڕینە تەوقی سەری؛ خوێنی کەسێک جمان؛ لە دین دەهری بوون؛ تووشی ڕق و تووڕەیی زۆر بوون ‹از این حرف خون من به جوش آمد: لەم قسە چاوم پەڕیە تەوقی سەرم›.

**خون کسی پای خودش بودن:** *[مجازی]* ئۆباڵ وە ئەستۆی خۆ بوون؛ خوێنی کەسێک لە پای خۆی بوون ‹اگر بیاید، خونش پای خودش است: ئەگەر بێت، ئۆباڵ وە ئەستوی خویە›.

**خون کسی حلال بودن:** *[مجازی]* خوێنی کەسێ ڕەوا بوون؛ خوێنی کەسێ حەڵاڵ بوون؛ کەسێک شیاوی کوژران بوون ‹اگر این کار را کرده باشد، خون او حلال است: ئەگەر ئەم کارەی کردبێت، خوێنی ڕەوایە›.

**خون کسی در نیامدن:** *[مجازی]* خوێن لێ نەهاتن؛ لەو پەڕی تووڕەییدا بوون و نیشان نەدان ‹اگر کارد می‌زدی خونش درنمی‌آمد: چەقۆت لێ بدایە خوێنی لێ نەدەهات›.

**خون کسی را به‌جوش آوردن:** *[مجازی]* قوشقی کردنی کەسێک؛ کەسێ زۆر تووڕە کردن ‹آن‌قدر گفت تا خونش را به جوش آورد: ئەوەندەی گوت هەتاکوو قوشقی کرد›.

**خون کسی را به گردن گرفتن:** *[مجازی]* خوێنی کەسێک وە ئەستۆگرتن؛ بەرپرسایەتی کوشتنی کەسێ قەبووڵ‌کردن ‹گفتند تو صغیری اعدامت نمی‌کنند، خون آرام را تو به گردن بگیر!: گوتیان تۆ بچووکی ناتکوژن، خوێنی ئارام وە ئەستو بگرە!›.

**خون کسی را پایمال کردن:** *[مجازی]* خوێنی کەسێک بە فیڕۆ دان؛ کەسێک کوشتن و سزا نەدیتن ‹نمی‌گذارم خون پسرم را پایمال کنند: نایەڵم خوێنی کوڕەکەم بە فیرو بدەن›. هەروەها: **خون کسی پایمال شدن**

**خون کسی را درشیشه کردن:** *[مجازی]* خوێنی کەسێ کردنە کاسەوە؛ زۆر بۆ کەسێک هێنان و ئازار دان ‹گرانفروشان خون مردم را در شیشه کرده‌اند: گرانفرۆشگەل خوێنی خەڵکیان کردوتە کاسەوە›.

**خون کسی را ریختن:** *[کنایی]* خوێن(ی کەسێک) ڕژاندن؛ کەسێ کوشتن.

**خون کسی را مکیدن:** *[مجازی]* خوێنی

کەسێک مژین؛ کەسێک چەوساندنەوە ‹مشتی سرمایه‌دار محتکر، خون مردم را می‌مکند: تاقمێک دەوڵەمەندی پاوانکار خوێنی خەڵک دەمژن›.

**خون گرفتن:** خوێن‌گرتن؛ ون‌گێرتەی: ۱. هەڵگرتن و گوێزانەوەی خوێن ۲. حیجامەت کردن؛ گرتنی خوێن بە کەڵەشاخ.

**از خون خود گذشتن:** *[مجازی]* دەست لە گیانی خۆ شۆردن؛ دەس لە گیان خۆ کێشان؛ بەرهەڤی گیان بەخت‌کردن و مردن بوون ‹از خون خود می‌گذرم و حسابت را می‌رسم: دەست لە گیان خوم دەشورم و عیلاجی دەردت ئەکەم›.

**به خون کسی تشنه بودن:** *[مجازی]* لە دووی سەری کەسێ گەڕان: ۱. ڕقی کەسێ لە دڵدا هەڵگرتن ‹او به خون من تشنه است: ئەو لە دووی سەری من دەگەڕی› ۲. خوازیاری کوشتنی کەسێ بوون.

**در خون خود غلتیدن:** *[کنایی]* لە خوێنی خۆدا گەوزین؛ خوێن لێڕژانی زۆر ‹وقتی رسیدیم، دیدیم در خون خودش غلتیده: کاتێک گەییشتین، دیمان لە خوێنی خویدا گەوزیوە›.

**خونابه** / xûnābe/: *اسم.* خوێناو؛ هووناو؛ ئاوی خوێناوی؛ خوێنی تێکەڵ بە ئاو؛ تراوێ کە لە کاتی گرسانی خوێندا بە سەریەوە دەمێنێتەوە.

**خون‌ادراری** / xûn'edrārî/: [فارسی/ عربی] ☜ **هماتوری**

**خون‌آشام** / xûnāšām، ـها/: *صفت.* خوێنخۆر؛ خوێنمژ ‹خفاش خون‌آشام: چەکچەکی خوێنخۆر›.

**خون‌آلود** / xûnālûd/: *صفت.* خوێنالی؛ خوێناوی؛ خوێناوڵین؛ خینالی؛ هوونالو؛ ونالین ‹در خانه‌اش کارد و لباسهای خون‌آلود پیدا کرده‌اند: لەماڵەکەیدا چەقۆ و جلی خوێنالییان دۆزیوەتەوە›.

**خونبار** / xûnbār/: *صفت.* خوێنبار؛ بە بارشتی خۆێناساوە ‹چشم خونبار: چاوی خوێنبار›.

**خون‌بر** / xûnbor/ ☜ **خون‌بند**

**خون‌بند** / xûnband/: *صفت.* خوێن‌بڕ؛ بە تایبەتیەکی وا بەر بە خوێن چوون بگرێ: **خون‌بُر**

**خون‌بها** / xûnbagā/: *اسم.* خوێن‌بایی؛ خوێن‌بژی؛ سەربەها؛ خیسڵ؛ نرخی خوێنی کوژراو کە لە مرۆکوژ (یان خزمانی) دەسێنرێ.

هەروەها: **خونبها خواستن/ دادن/ گرفتن**

**خونتا** / xontā ، ـها/: *اسم.* [؟] لێژنەی چەکداری بەڕێوەبەری وڵات دوای کوودەتا.

**خون‌جگر** / xûncegar/ ☜ **جگرخون**

**خونچکان** / xûnčekān/: *صفت.* خوێن‌دەڵێن؛ خوێن‌چکێن؛ هوون‌تکێن؛ وا کە تنۆکی خوێنی لێیەوە بتکێ ‹چشم خونچکان: چاوی خوێن‌دەڵین›.

**خونچه** / xonče/ ☜ **خوانچه**

**خونخوار** / xûnxār/: *صفت.* خوێنمژ: ۱. خوێنخوار؛ خوێنخۆر؛ خوێنڕێژ؛ گۆنجڕ؛ دەڤلخووین؛ زاڵم؛ مرۆکوژ؛ خوازیاری کوشتن و خوێن ڕژاندن ‹شاه خونخوار: شای خوێنخوار› ۲. بە تایبەتمەندی خواردن لە خوێنی گیانەوەرانی گەرمەخوێنەوە (وەکوو زالوو و هەندێک لە شەمشەمەکوێران).

**خونخواری** / xûnxārî/: *اسم.* خوێنمژی؛ گۆنجڕی؛ پیاوکوژی؛ خوێنخواری؛ گووجکاری؛ ستەمکاری؛ دۆخ یان چۆنیەتی خوێنمژ بوون.

**خونخواهی** / xûnxāhî، ـها/: *اسم.* خوێن‌خوایی؛ خوێن‌خۆیی؛ خوێن‌گری؛ کردوکۆش بۆ ئەستاندنەوەی تۆڵە لە کوژەر یان کوژەران ‹مردم به خونخواهی شهیدان برخاستند: خەڵک بۆ خوێن‌خویی شەهیدان هەستانەوە›.

**خون دماغ** / xûndamāq/: *اسم. [گفتاری]* ڕەوتی ڕزکیان؛ ڕسین؛ لووت‌پژان؛ لووت فیشەی؛ پژانی خوێنی بێڤل؛ خوێنی لووت بەر بوون.

▣ **خون‌دماغ شدن:** ڕسکین؛ پژان؛ خوێن لووت

بەربوون؛ خوێن لە کەپۆ هاتن؛ خوین لە بێقل هاتن؛ خوێن لووت بەربوون؛ ون لووت ئامەی ‹این‌قدر جلوی آفتاب نگرد، خون‌دماغ می‌شوی: هێندە لە بەر تاو مەگەڕە، دەرسکی›.

**خونروش** / xûnraveš/: *اسم. [پزشکی]* خوێن‌تووڕی؛ فیرکەی خوێنی.

**خونریزی** / xûnrîzî ، ـها/: *اسم.* خوێنڕێژی: ۱. ڕزک؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی پژانی خوێن لە ڕەگەوە ‹خونریزی داخلی: خوێنڕێژی ناوەکی› ۲. *[مجازی]* ستەمکاری؛ کار و ڕەوتی خوێنمژین و هەشافتن ‹جنگ و خونریزی: شەڕ و خوێنڕێژی›.

▣ **خونریزی داخلی**: خوێنڕێژی ناوەکی. هەروەها: **خونریزی خارجی**

▣ **خونریزی کردن**: خوێنڕێژی کردن؛ خوێن چوون؛ تووشی خوێنڕێژی بوون.

**خونزی** / xûnzî ، ـها؛ ـان/: *اسم. [زیست‌شناسی]* خوێنمژە؛ گیانداری کژنگی خوێن.

**خونساز** / xûnsāz ، ـها/: *صفت.* خوێن‌ساز؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی زۆرکردنەوەی هەندی هیمۆگلۆبین لە خوێندا.

**خونسرد** / xûnsard/: *صفت.* ۱. خوێن‌سارد؛ ون‌سەرد؛ بە تایبەتمەندی بەند بوونی تینی لەش بە دەمای ئاقارەوە ‹ماهی جانوری خونسرد است: ماسی گیاندارێکی خوێن‌ساردە› ۲. *[کنایی]* سست؛ شل‌وشەویق؛ کەم‌هەست ‹آرام بسیار خونسرد است: ئارام زۆر سستە› ۳. *[کنایی]* لەسەرخۆ؛ پشوودرێژ؛ خاوەن توانایی بەرگری کردن لە دەربڕینی بەرپەرچدانەوەی هەیەجانی لە بەرانبەر ڕووداوگەلێکی ناخۆش و نالەبارەوە ‹خونسرد باش، چیزی نیست: لەسەرخو بە، هیچ نیە› ❋ بەرامبەر: **خونگرم**

**خونسردی** / xûnsardî/: *اسم. [کنایی]* لەسەرخۆیی؛ ئارامی؛ پشوودرێژی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بە تاقەت بوون ‹خونسردی خوب است اما نە این‌قدر: پشوودرێژی چاکە، بەلام نەک ئەمەندە›.

**خونسنگ** / xûnsang/: *اسم.* هیماتیت؛ خاکی‌ئاسن؛ خاکێکی سوورکارە لە زۆرترین کانیگەلی ئاسن کە زیاتر بۆ دروست‌کردنی ئاسن و پۆلا دەکاردێ.

**خون‌شاشی** / xûnšāšî/ ☜ **هِماتوری**

**خون‌شناسی** / xûnšenāsî/: *اسم.* خوێن‌ناسی؛ لقێ لە زانستگەلی ژیان‌ناسی، سەبارەت بە خوێن و ئەوشتانەی کە خوێن پێکدێنن. هەروەها: **خون‌شناس**

**خونفشان** / xûnfešān/: *صفت. [ادبی]* ۱. خوێن‌پڕژێن؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی پژاندنی خوێنەوە ‹چشم خون‌فشان: چاوی خوێن‌پژێن› ۲. خوێنڕێژ.

**خونگرم** / xûngarm/: *صفت.* ۱. خوێنگەرم؛ بە تینی لەشی کەم تا کورت نەگۆڕ لە بەرانبەر گۆڕانی دەمای ئاقارەوە ۲. *[کنایی]* دلاوەر؛ بە دڵەو نزیک؛ خاوەن هەست و نەستی دلۆڤانە لە ئاست دلۆڤانی و دۆستی دیترانەوە ❋ بەرامبەر: **خونسرد**

**خونگرمی** / xûngarmî/: *اسم. [کنایی]* خوێنگەرمی؛ دلاوەری؛ ڕۆح‌سووکی؛ دۆخی بە هەست و نەست بوون.

**خونگیری** / xûngîrî ، ـها/: *اسم.* خوێنگری؛ کار یا ڕەوتی گرتنی خوێن لە گیاندار (مرۆ یان حیوان) بۆ تاقی‌کردنەوە، گۆزانەوە یان دەرمان.

**خونمردگی** / xûnmordegî ، ـها/: *اسم.* هەلازران؛ خوێن تێ‌تزان؛ خوێنی گرساوی ژێر پێست ‹در چند نقطه از بدنش، خونمردگی دیده می‌شد: لە چەند جێ لەشیدا، هەلازران دەبینرا›.

**خون‌هراسی** / xûnharāsî/: *اسم. [روان‌شناسی]* خوێنگرتوویی؛ خوێنگیری؛ ڕەوتی ترسان و تێکچوونی حاڵ لە دیتنی خوێن.

**خونی** / xûnî/: *صفت.* ۱. خوێنی؛ پێوەندیدار بە خوێنەوە ‹بیماری خونی: نەخۆشی خوێنی› ۲. خوێنین؛ خوێناوی؛ خوێنالی؛ خوێناولین؛

ونالّین؛ خوینەلۆ ‹پیراهن خونی: کراسی خوینالی›
٣. قەسایقەس؛ قەستەسەر؛ خاوەن ڕق و دژمنایەتی زۆر ‹دشمن خونی: دژمنی قەسایقەس›.

**خونین** / xûnîn/: *صفت. [ادبی]* خوێناوی: ١. خوێناوڵ؛ ونالین؛ گۆنین؛ گۆنێن ‹صورت خونین: ڕوومەتی خویناوی› ٢. بە کوشتوبڕ ‹جنگ خونین: شەڕی خویناوی›.

**خونین‌ومالین** / xûnîn-o-mālîn/: *صفت.* خوێناولین؛ خوێناولی؛ ونالین؛ خلتان‌خوێن؛ خلپان‌خوێن؛ بریندار و خوێناوی ‹او را خونین و مالین آوردند و خواباندند روی تخت: خوێناولین هێنایان و لە سەر تەخت درێژیان کرد›.

**خوی** / xoy/: *اسم.* ١. *[ادبی]* خۆ؛ خوهـ؛ خوە؛ ئارەق؛ هارەق؛ نمی لەش؛ ئارەقی لەش ٢. قوڵ؛ ئاوێ کە لە زەوی هەڵدەقولێ.

**خوی** / xûy، ـها/: *اسم. [ادبی]* خوو؛ خۆ؛ خو؛ خووی؛ خدە؛ خدێ؛ خدێک؛ هو؛ ڕەوشت؛ ئاکار؛ نەریت؛ قەوات.

**خویش**[1] / xîš، ـها؛ ـان/: *اسم.* خزم؛ کەس؛ کریڤ؛ کرێڤ؛ کریو؛ خێش؛ خوێش؛ کەس‌وکار؛ قەوم؛ نیاس ‹خویش نزدیک ماست: خزمی نزیکمانە›.

**خویش**[2]: *ضمیر. [ادبی]* خۆ؛ خوە؛ وێ؛ خۆی؛ خدی کەس ‹دست خویش؛ کتاب خویش: دەستی خۆ؛ کتێبی خۆ›.

**خویشاوند** / xîšāvand، ـها؛ ـان/: *اسم.* خزم؛ خوێش؛ خێش؛ لێز؛ مریبا؛ مەردوم؛ مەرڤ؛ کریف؛ کرێف؛ کریو؛ نیاس؛ مەرەڤ؛ قەوم؛ قیل؛ قۆم؛ قەوم و قیلە؛ کەس‌وکار ‹با هرکس خویشاوند بود، کمکش می‌کرد و دستش را می‌گرفت: لەگەڵ هەر کە خزم بوایە، یاریدەی دەدا و دەستی دەگرت›.

▣ **خویشاوند سببی**: خزمی ژن و ژنخواز؛ هەموو ئەو خزمانە کە بە بۆنەی ژن‌هێنان یان شوو کردنی کەسێکەوە بوونەتە خزم ‹عموی زنت، خویشاوند سببی تو می‌شود: مامی ژنەکەت ئەبێتە خزمی ژن و ژنخوازی تۆ›.

**خویشاوند نسبی**: خزمی خوێنی؛ خزمی هاوپشت؛ هاوتیرە ‹عموی تو خویشاوند نسبی توست: مامت، خزمی خوێنی تۆیە›.

**خویشاوند نزدیک**: خزمی نزیک؛ برەبرە؛ لێزم؛ قەومی نزیک. هەروەها: **خویشاوند دور**

**خویشاوندی** / xîšāvandî، ـها/: *اسم.* خزمایەتی؛ خۆیایەتی؛ خوێشایەتی؛ خوێشی؛ خێشی؛ خۆیەتی؛ قەومایەتی؛ قەومی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خزم بوون ‹آرام با سارا رابطەی خویشاوندی ندارد: ئارام پێوەندی خزمایەتی لەگەڵ سارادا نیە›.

**خویشتن** / xîštan/: *ضمیر. [ادبی]* خۆ؛ خوە؛ وێ؛ خۆی؛ خودی کەس ‹سرای خویشتن: ماڵی خۆ›.

**خویشتن‌بینی** / xîštanbînî/: *اسم. [ادبی]* خۆبینی؛ فیز؛ بادی هەوایی؛ خۆ پەسندی.

**خویشتندار** / xîštandār/: *صفت.* خۆ ڕاگر؛ خوددار؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە خۆڕاگری.

**خویشتن‌داری** / xîštandārî، ـها/: *اسم. [ادبی]* خۆڕاگری؛ دۆخی بەر خۆگرتن لە بەرانبەر نیشاندانی هەر چەشنە کردەوەیەکی دژبەریەوە.

**خویشفرما** / xîšfarmā، ـها؛ ـان/: *اسم.* خۆفرمان؛ کەسێ کە خاوەن‌کاری خۆیەتی و بە جێی فرۆشتنی هێزی کاری، بەرهەمی کارەکەی بە کڕیار دەفرۆشێ.

**خویشکار** / xîškār، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* ١. ئەرکناس؛ وەخۆگر؛ کەسێ کە ئەرکی سەرشانی خۆی جوان و ڕێک‌وپێک بەڕێوە دەبا ٢. ئاماتۆر.

**خویشکاری** / xîškārî/: *اسم. [ادبی]* ١. ئەرکناسی؛ وەخۆ گری ٢. ئاماتۆری.

**خویشی** / xîšî/: *اسم.* خزمایەتی؛ خوێشی؛ خێشی؛ خۆیایەتی؛ قەومایەتی.

**ـ خویی** / xûyî/: *پیوازه.* ـ خۆیی؛ ـ ڕەوشتی؛ ـ خوویی؛ دۆخی هوکارە بوون ‹تندخویی؛ درندەخویی: توندەخویی؛ دڕندەخۆیی›: **خوئی**

**خیابان** / xiyābān ، ـها/:اسم. شەقام؛ خیابان: ١. ڕێگەی پان و پێکوت‌کراو؛ ڕێگایەکی گشتی کە لە شار یان گوندێک دروست‌کراوە و زۆرتر لە دوو لاوە پیادەڕۆی هەیە ٢. ڕاستەڕێ؛ بوارگەیەکی پانی خشت‌ڕێژی‌کراو لە باخ، پارک، وەرزشتگا و...دا.

▣ **خیابان گز کردن**:/کنایی/ ڕاوێچکە کردن؛ پیاسەکردن؛ خیابان پیمەی؛ بێ‌قازانج ڕێگە کوتان.

**خیابان‌بندی** / xiyābānbandî ، ـها/:اسم. شەقام‌ڕێژی؛ شەقام‌بەندی؛ گەلاڵەداڕێژی بۆ کێشانی شەقامی گەڕەک یان شارێک.

**خیابان کشی** / xiyābānkešî ، ـها/:اسم. شەقام‌کێشی؛ کار یان ڕەوتی دروست‌کردنی شەقام.

**خیابان‌گردی** / xiyābāngardî ، ـها/:اسم. ١. پیاسە؛ کاری گەڕان بە شەقامدا ٢./کنایی/ ڕاوێچکە؛ لە بەر بێکاری یا بۆ کات دانەسەر ڕێگە کوتان.

**خیابانی** / xiyābānî/: صفت. شەقامی؛ خیابانی ‹تظاهرات خیابانی: خۆ پیشاندانی شەقامی›.

**خیار** / xiyār ، ـات/:اسم. ١. ـها/ خەیار؛ خیار؛ خێیار؛ هاروو؛ ئارو؛ هارو؛ یارو؛ هاروێ؛ ئاروێ؛ بنەگیاییێکی لاسک‌ڕاکشاوی تووکنە بە گەڵای پانی ددانەدار، گوڵی زەرد و بەری خواردنی بۆنخۆشەوە ٢. ـها/ خەیار؛ هاروو؛ ئاروو؛ بەری ئەو گیایە ٣./حقوق/ [عربی] بژارە؛ ئیختیارێک کە بە هەر دوو لای سەودا دەدرێ، بۆ بەتاڵ کردنەوەی مامەڵەیان.

▣ **خیار اصلی**:/حقوق/ بژارەی بنەمایی؛ بژارەی سەرەکی؛ سەربەستیەک کە بە بڕیاری قانوون بۆ هەموو کەسێک هەیە.

**خیار تأخیر**:/حقوق/ ئیختیاری فرۆشیار بۆ بەتاڵ کردنەوەی سەودا و مامەڵە، ئەگەر کڕیار بایی ئەو شتەی کڕیویە لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا نەدا.

**خیار تدلیس**:/حقوق/ بژارەی دەلەسە؛ ئیختیاری کڕیار بۆ بەتاڵ کردنەوەی مامەڵە، ئەگەر فرۆشیار لەو شتەدا کە فرۆشتوویەتی فێڵی کردبێ.

**خیار ترشی**: ١. خەیار تورشی؛ خەیار ترشی؛ خیاری ورد و جوان بۆ ترشیات ٢. ☜ **خیارترشی**

**خیار چنبر** ☜ **خیارچنبر**

**خیار حیوان**:/حقوق/ بژارەی ئاژەڵ؛ ئیختیاری کڕیار بۆ بەتاڵ‌کردنەوەی مامەڵە تا سێ ڕۆژ دوای مامەڵەکە، ئەگەر ئەوشتەی کە مامەڵە کراوە ئاژەڵ بێ.

**خیار رُویت**:/حقوق/ بژارەی دیتن؛ ئیختیاری کڕیار بۆ هەڵوەشاندنی سەودا، ئەگەر کاڵاکە شتێک بێ جگە لەوەی کە پێشتر دیویە.

**خیار شرط**:/حقوق/ بژارەی مەرج؛ شەرتێک کە لە سەودا بۆ هەر دوو لای مامەڵە دابین کرابێ (وەکوو ئەوە کە ئەگەر کڕیار تا دوو مانگ کاڵاکەی نەویست، مافی هەڵوەشاندنی هەیە).

**خیار عیب**:/حقوق/ بژارەی خەوش؛ ئیختیاری کڕیار بۆ هەڵوەشاندنەوە ئەگەر دوای مامەڵە ڕوون ببێتەوە کاڵاکە عەیبی هەیە و پێشتر فرۆشیار ئەوەی نەگوتووە.

**خیار عین**:/حقوق/ بژارەی چاو پێ‌کەوتن؛ ئیختیاری کڕیار بۆ هەڵوەشاندنەوە، ئەگەر کاڵاکە لە دەستی فرۆشیاردا نەبێت (وەک فرۆشتنی ئەو ماسیە کە هێشتا نەگیراوە).

**خیار غَبن**:/حقوق/ بژارەی گزی؛ ئیختیاری هەرکام لە دوو لای مامەڵە بۆ هەڵوەشاندنەوە ئەگەر هەرلایێکی مامەڵەکە بوویتە هۆی خەسار دیتنی ئەوی دیکەیان.

**خیار قلمی**: خەیاری قەڵەمی؛ خەیارێ لووس و باریک.

**خیار مجلس**:/حقوق/ بژارەی کۆڕ؛ ئیختیاری

هەر دوو لای مامەڵە بۆ هەڵوەشاندنەوە تا کاتێ کە لە کۆڕی مامەڵەکە نەهاتبێتنە دەرەوە.

**خیار ترشی** / xiyārtorşî:/اسم. ترشیاتی خەیار؛ خەیار تورش؛ خەیارێ کە لە سرکەدا هێشتوویانەتەوە و ترش بووە و بۆتە ترشی.

**خیارچنبر** / xiyārčambar, -čanbar، ـها:/اسم. ترۆزی؛ تەرۆزی؛ ترێزوو؛ چەماو؛ چەمیلە؛ شارۆخ؛ شارۆق؛ قتی؛ خەیار چەمەر؛ چەمەرە خەیار؛ خەیار چەمبەر؛ خیارشینگ؛ کالیاری فەریک و کاڵ، بە شێوەی کەوان، بە پێستی ڕێ- ڕێ و زرووە.

**خیارشور** / xiyāršûr، ـها:/اسم. خەیارشۆر؛ خیارشۆر؛ خەیارێکی ماوەیێک لە ناو ئاوخوێ نراو، کە وەک تامی خۆراکی بە کاری دەبەن.

**خیارک** / xiyārak، ـها:/اسم. [پزشکی] لووکوان؛ ئالگ؛ تەشەنەی لووی ناوگەڵ یان بنھەنگڵ.

**خیاره** / xiyāre:/اسم. درزی ئەستوون؛ کێڕ؛ کێڵ؛ گاز؛ درزی باز بووی بەرەوخوار.

**خیاط** / xayyāt، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. دروومانکار: ۱. کەسێ کە لە خەیاتیدا توانایە ۲. خەیات؛ جلدروو؛ بەرگدوور؛ بەرگدروو؛ ماشێنەچی؛ ماکینەچی؛ مەکینەچی؛ دەرزی؛ جل وراز.

**خیاطی** / xayyātî/: [عربی]/اسم. خەیاتی؛ دروومانکاری: ۱. وراستەی؛ ورازین؛ دروومان؛ کاری دوورینی گنج و هەر شتێ کە لە پارچە بێ ‹دارم خیاطی می‌کنم: خەریکم خەیاتی دەکەم› ۲. پیشەی دروومانکار ‹خیاطی شغل من است: خەیاتی پیشەی منە› ۳. /ـها/ شوێنی دروومان ‹در خیاطی کار می‌کنم: لە خەیاتیدا کار دەکەم› ❊ دوزندگی

▣ **خیاطی زنانه:** کارگایەک بەرگی ژنانی تێدا ئەدوورن. هەروەها: **خیاطی مردانه**

▣ **خیاطی کردن:** جل و بەرگ دوورین؛ خەیاتی کردن؛ خەریکی دروومانکاریبوون؛ سازکردنی جل و بەرگ.

**خیال** / xiyāl، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. خەیاڵ؛ خیاڵ: ۱. بوورە؛ بیر؛ یاد؛ کار یا ڕەوتی هێنانە بەر چاوی شتێک لە مێشکدا، کاتێک کە ئەو شتە لە پێشچاودا نەبێ ‹همین که بیکار می‌شد، خیال وطن، خانه و خانواده به سراغش می‌آمد: هەرکە بێکار دەبوو، خەیاڵی نیشتمان، ماڵ و بنەماڵەکەی دەیدایە سەری› ۲. گومان؛ گەمان؛ تێڕوانین؛ بۆچوونێک کە بەبۆنەی بەهەڵەچوونی هشکەوە دێتە ناو مێشک ‹به خیال من کسی پشت پنجره بود: بە خەیاڵی من کەسێک لە پشت پەنجەرەکەدا بوو› ۳. بوورە؛ هزر؛ بیرێک کە بەرهەمی مێشک و بۆچوونەکانی بێ، نەک داهاتێیکی ڕاستەقینە ٤. بۆچوون؛ بیر و ئەندێشەیەک کە هێشتا لە دنیای ڕاستەقینەی دەرەوە نەبینراوە و بەکار نەهێنراوە ٥. [مجازی] بوورە؛ هزر ‹او را در خیال مجسم می‌کرد: لە خەیاڵدا دەیهێنایە بەرچاو› ٦. [گفتاری] ترس؛ سام؛ سامی؛ تەرسی؛ ئەندێشە؛ بیر و بۆچوونێک کە بە هۆی خۆف و پەرێشانیەوە بەدی بێ ‹خیال برش داشت که نکند همسایه‌اش دزد باشد: ترس دایگرت، نەکا جیرانەکەی دز بێت› ۷. [گفتاری] گریمان ‹خیال کن او دزد، چه چیز تو را می‌خواهد ببرد؟: گریمان دزبێ، چیت هەیە ببیا؟› ۸. گومان؛ گەمان ‹خیال می‌کنی او از عهدەی این کار برمی‌آید؟: خەیاڵ دەکەی ئەم کارەی پێ دەکرێ؟›.

▣ **خیال باطل/ خام/ واهی:** خەیاڵپلاو؛ خەیاڵیخاو؛ بیری هەرز؛ بوورەی دوور؛ لێکدانەوەی بێ‌بەهرە.

▣ **خیال بد به دل راه ندادن:** دڵ پەرێشان نەکردن؛ نیگەران و پەشێو نەبوون ‹هر جا باشد تا یک ساعت دیگر برمی‌گردد، خیال بد به دلت راه نده: لە هەر کوێ بێ تا سەعاتێکیتر دێتەوە، دڵی خۆت پەریشان مەکە›.

**خیال بد کردن:** بیری خراپ کردنەوە؛ گومانی خراپ‌کردن؛ خەیالّی خراپ‌کردن ‹خیال بد نکن او می‌خواست کمکت کند: بیری خراپ مەکەوە، ئەو دەیویست یاریدەت بدا›.

**خیال برداشتن:** ترس داگرتن؛ تووشی دڵزراوی هاتن؛ ترس لێ‌نیشتنەوە ‹در آن تنهایی خیال برش‌داشته بود: لەو تەنیاییەدا ترس دایگرتبوو›.

**خیال داشتن:** بە نیاز بوون؛ گەرەک بوون؛ هەرەک بوون؛ ویستن ‹خیال داشت خانه را بفروشد، من نگذاشتم: بە نیاز بوو ماڵەکە بفرۆشێ، من نەمهێشت›.

**خیال در سر پروراندن:** مرخ لێ‌خۆش‌کردن؛ خەیاڵ پلاوکردن؛ خەیاڵێکی نابەجێ لە مێشکدا بارهێنان ‹سالها این خیال را در سر می‌پروراند که آن خانه را تصاحب کند: چەنای چەند ساڵ مرخی لێ خۆش کردبوو ئەو ماڵە داگیر کا›.

**خیال کردن:** خەیاڵ کردن؛ گومان کردن؛ وازانین؛ پاسەی زانەی.

**خیال کسی جمع بودن:** ئارخەیان بوون؛ نەبوونی نیگەرانی؛ ئاسوودەخاتر بوون ‹از بابت مغازه خیالم جمع است: لەمەڕ دووکانەکەوە ئارخەیانم›. هەروەها: **خیال کسی راحت بودن**

**بە خیال افتادن:** کەوتنە خەیاڵەوە؛ وە خەیاڵ‌کەوتن؛ نیەت‌کردن ‹به خیال زن گرفتن افتاد: کەوتە خەیاڵی ژن هێنانەوە›.

**بە خیال کسی رسیدن:** ۱. گومان کردن؛ وازانین ‹به خیالش رسید چیزی پشت درختها تکان می‌خورد: گومانی کرد شتێک لە پشت دارەکانەوە دەجووڵێتەوە› ۲. بیرکردنەوە ‹به خیالم رسید بهتر است همه چیز را ول کنم و بروم: بیرم کردەوە چاترە دەست لە هەموو شتێک بەردەم و برۆم›.

**خیالات** / xiyālāt/: [عربی] اسم. [گفتاری] خەیالات؛ وەژارە؛ شەڤرەشک؛ خاو و خیاڵ ‹آن شب خیالات او نگذاشت بخوابم: ئەو شەوە خەیالاتی نەیهێشت بخەوم›.

**خیالاتی** / xiyālātî/: [عربی] صفت. خەیالاوی؛ خەیالاتی؛ ترس و گومان پێوەپێچراو ‹مثل این‌که خیالاتی شده‌ای، اینجا که چیزی نیست: وا دیارە خەیالاوی بووی، لێرە خۆ شتێک نیە›.

**خیال‌انگیز** / xiyālangîz/: [عربی/ فارسی] صفت. دڵڕفێن؛ دڵبزوێن؛ هۆی بەدیهاتنی خەیاڵی خۆش ‹دشت، زیبایی خیال‌انگیزی داشت: دەشتەکە، جوانیەکی دلرفینی بوو›.

**خیالباف** / xiyālbāf، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. خەیاڵپەروەر؛ خەیاڵباف؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە خەیاڵپەروەری ‹جوان خیالباف: لاوی خەیالپەروەر›.

**خیالبافی** / xiyālbāfî، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. خەیاڵپەروەری؛ کار یا ڕەوتی پەروەراندنی بیر و هزری ناڕاست یان ناکردەوەیی ‹بس است دیگر، دست از این خیالبافی بردار و قدری چشمت را باز کن: بەسە ئیتر، دەس لەم خەیالپەروەریە هەڵگرە و تۆزێک چاوت بکەوە›.

**خیالپرداز** / xiyālpardāz، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. ۱. خەیالاتی؛ خەیالاوی ۲. خەیاڵپەروەر؛ خاوەن ئۆگرەتی یان توانایی خۆش کردنی وێنە و دیمەنی خەیاڵی.

**خیالپردازی** / xiyālpardāzî، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. ۱. دۆخ یان چۆنیەتی خەیالاوی بوون ۲. خەیاڵپەروەری؛ ڕەوتی هێنانە بەر چاوی دیمەنی خەیاڵی.

**خیالپرست** / xiyālparast، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. خەیاڵپەرست؛ خوازیاری ڕووداوانی خەیاڵی و هزر و بیری ناکردەوەیی. هەروەها: **خیالپرستی**

**خیالپرور** / xiyālparvar/: [عربی/ فارسی] صفت. ۱. خەیاڵپەروەر ۲. خەیالاتی؛ ئۆگری خۆش کردنی وێنەی زەینی و خەیاڵی.

**خیالپروری** / xiyālparvarî، ـها/: [عربی/ فارسی]

/اسم. خەیاڵپەروەری؛ ڕەوتی هێنانە بەر چاوی دیمەن یان بابەتی خەیاڵی.

**خیالی** / xiyālî/: [عربی] صفت. خەیاڵی؛ خیالی: ۱. ناڕاست ‹قهرمان خیالی: قارەمانی خەیاڵی› ۲. ناکردەوەیانە؛ ناکارانە؛ ناکرداری ‹نقشەهای خیالی: نەخشەگەلی خەیاڵی›.

**خیانت** / xiyānat، ـها/: [عربی]/اسم. ناپاکی؛ خەیانەت؛ دوخمانی؛ کارێکی دژ بە بڕوا و ئەمەگداری لە حاند کەس یان کەسانی ترەوە ‹خیانت در امانت؛ خیانت به وطن: خەیانەت لە ئەمانەتدا؛ خەیانەت بە نیشتمان›. هەروەها: **خیانت دیدن؛ خیانت کردن؛ خیانت ورزیدن**

**خیانت آمیز** / xiyānatāmîz/: [عربی/ فارسی] صفت. ناپاکانە ‹رفتار خیانت‌امیز: کردەوەی ناپاکانە›.

**خیانت پیشگی** / xiyānatpîšegî/: [عربی/ فارسی] /اسم. ناپاکی؛ ناپاکیەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خەیانەت کردنە پیشە.

**خیانت پیشه** / xiyānatpîše، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] صفت. ناپاک؛ بە عادەت و هۆگری خەیانەت کردنەوە ‹شریکش خیانت‌پیشه بود: شەریکەکەی ناپاک بوو›.

**خیانتکار** / xiyānatkār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. دوخمان؛ خاین؛ ناپاک ‹دوست خیانتکار؛ همسر خیانتکار: دۆستی دوخمان؛ هاوسەری خاین›.

**خیت** / xît/: /اسم. خیت: ۱. ناکام؛ سەر نەکەوتوو ‹یا شدیم رفتیم سینما، بلیط تمام شده بود، خیت شدیم: هەستاین ڕۆیشتین بۆ سینەما، بلیت تەواو ببوو، خیت بووین› ۲. سەرشۆڕ ‹با این پذیرایی‌ات مرا جلو مهمانها خیت کردی: بەم میوانداریەت منت لە لای میوانەکانەوە خیت کرد›

❋ **خیط**

▣ خیت کاشتن: خراپکاری کردن؛ تێ‌ڕیان؛ کارێک بە خراپی جێبەجێ کردن و تێیدا سەرنەکەوتن ‹با این سخنرانیت خیت کاشتی و آبروی ما را هم بردی: بەم وتاردانەت خراپکاریت کرد و ئابرووی ئێمەشت برد›.

**خیتی** / xîtî/: /اسم. [گفتاری] ۱. نەهاتی؛ ناکامی ۲. سەرشۆڕی؛ شەرمەزاری ❋ **خیطی**

▣ **خیتی بالا آوردن:** خراپکاری کردن؛ تێ‌ڕیان؛ شکست خواردن؛ لە کارێکدا سەرنەکەوتن ‹سر امتحان خیتی بالا آوردم و نتوانستم درست جواب بدهم: لە ئەزموونەکەدا خراپکاریم کرد و نەمتوانی چاک وەڵام بدەمەوە›.

**خیر** / xayyer، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. خێرەومەند؛ خێرەومەن؛ خێرکار؛ نووک‌کار؛ خاوەن چاکە؛ بە پیاوەتی ‹مردم خیّر به یاری سیلزدگان شتافتند: خەڵکی خێرەومەند چوونە فریای لافاو لێداوەکانەوە›.

**خیر**[1] / xeyr/: [عربی]/اسم. خێر؛ خەیرە: ۱. کاری چاکە ‹خیر دیدن؛ کار خیر: خێر دیتن؛ کاری خێر› ۲. قازانج؛ بەهرە؛ فایدە ‹خیر او به کسی نمی‌رسد: خێری بە کەس ناگا›.

▣ **خیر بردن** ☜ **خیر دیدن**

**خیر بودن:** چاک بوون؛ خاس بوون؛ خێر بوون ‹نیتتان خیر است: نیازتان چاکە›.

**خیر دیدن:** خێر دیتن؛ چاکە دیتن؛ خاسە دیتن؛ بەهرە پێ گەیشتن ‹ببر، خیرش را ببین؛ پسرم، خیر ببینی: بیبە، خێری لێ ببینی؛ کوڕەکەم، خەیر بوینی›: **خیر بردن**

**خیر رساندن:** خێرگەیاندن؛ بەهرە پێ گەیاندن؛ قازانج‌گەیاندن ‹تا حالا چقدر به تو خیر رسانده باشد خوب است؟: تا ئێستا چەندی خێر پێت گەیاندبێ باشە؟›.

**خیر کسی را خواستن:** خێری کەسێ ویستن/ خواستن؛ هەرەک بوونی خێر و بەختەوەری کەسێک ‹پدرت خیر تو را می‌خواهد: باوکت خێری توی دەوێ›.

**خیر کسی رسیدن:** خەیر کەسێ گەیشتن؛ لە وی قازانج گەیشتن؛ لە کەسێکەوە خێرێک گەیشتن ‹خیر او به کسی نرسیده که من دومی‌اش

باشم: ئەو خەیری بەکەس نەگەییوە تا من دووهەمیان بم›.

**به خیر گذشتن:** بە خێر چوون؛ خوا لادان؛ خوا دایوە ‹نزدیک بود بروم زیر ماشین، به خیر گذشت: خەریک بوو بچمە ژێر ماشینەوە، بە خێر چوو›.

**خیر** [2]: قید. [گفتاری] نا؛ نە؛ نەی؛ نێ هەرێ؛ نەبەڵێ؛ خەیر؛ خێر؛ نەخێر؛ نەخەیر؛ وەرامی نەرێنی ماقووڵانە ‹خیر، این‌طور نیست: نا، وا نیە›.

**خیرات** / xeyrāt/: [عربی]/اسم. خێرات: ۱. چاکەکاری، بەتایبەت بۆ وەدەس هێنانی جەزای بەخێر ‹چقدر برای پدرش خیرات می‌کند!: چەندە بۆ باوکی خێرات دەکا!› ۲. سەدەقە؛ کار یا ڕەوتی ماڵ بەخشین لە ڕێگەی خودادا ‹در راه خدا خیرات کن: لە ڕێی خودا خێرات کە›. هەروەها: **خیرات کردن**

**خیراتی** / xeyrātî/: [عربی] صفت. خێراتی؛ خێرات بووگ یان تایبەتی خێرات ‹حلوای خیراتی آورده بود: هەڵوای خێراتی هێنابوو›.

**خیراندیش** / xeyrandîš، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. خێرئەندیش؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە بیرکردنەوە لە ڕێی چاکەی دیتراندا ‹دوستان خیراندیش به او توصیه کردند، مغازه باز کند: دۆستانی خێرئەندیش پێیان ڕاسپارد دووکانێک دانێ›. هەروەها: **خیراندیشی**

**خیرخواه** / xeyrxāh، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. خێرخواز؛ چاکەخواز؛ خێرخوا؛ خوازیاری خێرۆمەندی ‹او بخشنده و خیرخواه مردم بود: ئەو دەهەندە و خێرخوازی خەڵک بوو›.

**خیرخواهانه** / xeyrxāhāne/: [عربی/ فارسی] صفت. خێرخوازانە؛ خێرخوایانە؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی خێرخوازیەوە ‹نصیحت خیرخواهانه؛ فعالیت خیرخواهانه: ئامۆژیاری خێرخوایانە؛ چالاکی خێرخوازانە›.

**خیرخواهی** / xeyrxāhî، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. خێرخوازی؛ خێرخوایی؛ هۆگری جێبەجێ کردنی کارگەلی وا کە قازانجی بۆ کەسانی دیکەیە ‹این حرف من از روی خیرخواهی بود: ئەم قسەی منە لە ڕووی خێرخوازیەوە بوو›.

**خیرگی** / xîregî/: اسم. ۱. مرِی؛ وڕی؛ بزی؛ ماقی؛ دۆخ یان چۆنیەتی چاو زەق بوون ۲. شەواره؛ شەوارەیی؛ پەککەوتوویی لە دیتنی شتان بە هۆی زۆری تیشکەوە ۳. لەجی؛ هەرزەیی؛ لاساری.

**خیرمقدم** / xeyremaqdam/: [عربی]/اسم. بەخێراتن؛ خێرهاتن؛ خێرئامەی؛ وەش‌ئامەی؛ وتەیەک کە بۆ دەربڕینی خۆشحاڵی لە هاتنی کەسێک پێ دەگوترێ ‹یکی از دانش‌آموزان به میهمانان خیرمقدم گفت: یەک لە قوتابیان بەخێرهاتنی میوانانی کرد›.

**خیروبرکت** / xeyr-o-bar(e)kat, -barakat/: [عربی]/اسم. [گفتاری] خێر و بێر؛ خەیر و بەیر؛ خێر و بەرەکەت؛ کەڵک و قازانجێ کە درێژەی هەیە یان لە زۆر بووندایە ‹آن روزها کسب مردم خیر و برکت دیگری داشت: ئەو ڕۆژانە کاسپی خەڵک خێر و بیرێکی دیکەی هەبوو›.

**خیره** / xîre/: صفت. ۱. ماق؛ زاق؛ زەق؛ بز؛ گز؛ زەقابی؛ واق؛ زل؛ مرِ؛ وڕ؛ هوڕ ‹نگاه خیره؛ چشم خیره: نوای ماق؛ چاوی زاق› ۲. [ادبی] بێهوودە؛ پووچ ۳. [ادبی] پەرێشان؛ پەشێو. هەروەها: **خیره شدن؛ خیره کردن**

**خیره‌سر** / xîresar، ـها/: صفت. لەج؛ لاسار؛ لەسەر؛ لەسار؛ هەرزە؛ سەرسەخت؛ سەربزێو؛ گوێ نەبیس لە قسەی خەڵک. هەروەها: **خیره‌سری**

**خیری** / xeyrî/ ☜ **شب‌بو**

**خیریه** / xeyrîyye/: [عربی] صفت. چاکەکاری ‹مؤسسەی خیریه: دامەزراوەی چاکەکاری›.

**خیز** [1] / xîz/: اسم. ۱. باز؛ هەڵبەز؛ هەڵوەز؛ تاو؛ گومەتە؛ لیتک؛ بزووتنەوەی لەپڕ و بەرەو سەر ‹خیز برداشتن: بازدان› ۲. باز؛ هەڵبەز؛ بەرزایی

هـەر پلەیـەکی پلیکـان ‹خیـز پلـه: بـازی پلـه›
٣. /پزشکی/ وەرهەم؛ تۆقلە؛ بلۆق؛ کۆ بوونـەوەی نا ئاسایی و لە ڕادەبەدەری تـراو لـە بۆشـایەکی لەشدا ٤. /گفتاری/ هێـرش؛ پـەلامار؛ هەڵـمەت؛ شاتاول. هەروەها: **خیز برداشتن**

**ـ خیز**[٢]: پیواژه. ١. ـــ دار؛ نـەخت؛ بـە بـەر و بـوو ‹حاصلخیز: نفتخیز: بەردار؛ نەوتدار› ٢. /ان/ ـخیـز؛ ـ ڕاب؛ ـهەڵس؛ ڕاپەر ‹سحرخیز: سەحەرخیز›.

**خیزاب** / xîzāb ، ـها/: /اسم. لیپاو؛ لۆچاو؛ خێـزاو؛ ئاقزین؛ گاپێل؛ نێرینەی ئاو.

**خیزان** / xîzān/: قید. هەڵس؛ هـۆرز؛ هەڵـتەک؛ ئاخێزان ‹اُفتان و خیزان: بە هەڵس‌وکەوتەوە›.

**خیزاندن** / xîzāndan/: مصدر متعدی. //**خیزاندی:** هەڵـتـساند؛ **مـی‌خیزانـی**: هەڵدەسـتێنی؛ **بِخیـزان:** هەڵـسێنە// هەسـتاندن؛ هەڵـساندن؛ هۆرزنـەی؛ هۆرێزنـای؛ ڕاپەڕانـدن؛ هۆربێزنـەی؛ خێزنـەی؛ کەسێک یان شـتێک لـە جێـی خۆیـدا بـەرز و ڕاست کردنەوە ‹بە زور او را از جای خیزاند: بەزۆر لـە سەر جێ هەڵیساند›: **خیزانیدن**

■ صـفت فـاعلی: **خیزاننـده** (هەڵـسێنەر)/ صـفت مفعولی: **خیزانده** (هەڵسێنراو)/ مصدر منفـی: **نَخیزان** (هەڵنەستاندن)

**خیزانیدن** / xîzānîdan/ ☜ **خیزاندن**

**خیزران** / xeyzarān ، ـها/: [عربی]/اسم. ئـارج؛ گوهیش؛ حەیزەران؛ هەزیران؛ هزیـران؛ بـامبوو؛ قامیـشەهێندی؛ تەرگـەز؛ قامیـشی گـەرمیان؛ گیایێکی تایبەتی ناوچەگەلی گـەرم و شـێدارە، چەند جۆری هەیە، بە لاسکی قورۆڵ یان ناوپڕ و گەڵای درێژ وەک هی خورماوە، لە لقی گۆچـان و داردەس چێ دەبێ و لە گەڵا و پێـستەکەشی تەناف و ڕایەخ دەچنرێ: **نی خیزران**

**خیزش** / xîzeš/: /اسم. ١. ئاخێز؛ کار یـان ڕەوتی هەستان؛ هەڵسان؛ هۆرسەی ٢. /ـها/ شـۆرش؛ ڕاپەڕین.

**خیزک** / xîzak/: /اسم. ترۆپـک؛ دهـار؛ دوچـک؛ قووچکە.

**خیس** / xîs/: صفت. تـەڕ؛ فـیس؛ شـل؛ لـیس؛ نمدار؛ شەدار؛ شۆدار؛ کەوتا؛ گەوزاو لە تراوێکـدا ‹دست خیس؛ لباس خیس: دەسی تەڕ؛ جلی فیس›.

▣ **خـیس خـوردن:** خووسـان؛ نمـان؛ نمیـان؛ فیسیەی؛ تێـرۆ چـوونی ئـاو دە نـاو شـتێکدا ‹آلوها را گذاشتم داخل آب، خیس بخورند: ئاڵووەکانم نایە ئاو بخووسێن›.

**خـیس شـدن:** خووسـان؛ فیـسان؛ فیـسیان؛ فیسیەی؛ تەڕ بوون؛ شل بوون ‹زیر بـاران پـاک خیس شدم: لە ژێر باراندا تەواو خووسام›.

**خـیس کـردن:** ١. خووسـاندن؛ فیـساندن؛ فیسانن؛ فیسنەی؛ فیسەنە؛ تەڕکردن ‹لباسها را توی تشت خیس کردم: جلەکانم لە ناو تەشـتەکەدا خووساند› ٢. میزکردن؛ تەڕکردن؛ هەڵـمیزتن بە شتێکدا ‹بچه خودش را خیس کـرد: منداڵـەکە خۆی تەڕ کرد›.

**خیـــساندن** / xîsāndan/: مـــصدر متعـــدی. // **خیـــساندی:** خووســـاندت؛ **مـــی‌خیـــسانی:** دەخووســـێنی؛ **بِخیـــسان:** بخووســـێنە// خووسـاندن؛ فیـسنەی؛ فیـسنای؛ فیـساندن؛ نمانـدن؛ تلیـساندن؛ تلیـساندن؛ شـتێک بـۆ تەڕ بـوون لەگـەڵ ئـاو یـان هـەر تراوێکـی‌تـردا تێـوەدان ‹بـرنج خیـساندن: بـرینج خووسـاندن›: **خیسانیدن**. هەروەها: **خیساندنی**

■ صفت فـاعلی: **خیـساننده** (خووسـێنەر)/ صـفت مفعـولی: **خیـسانده** (خووسـێنراو)/ مـصدر منفـی: **نَخیساندن** (نەخووساندن)

**خیسانده** / xîsānde/: /اسم. میـوەی وشـکەوکراو یان دەنکەگیای دەرمان کە کراوەتە نێو ئاوەوە.

**خیسانیدن** / xîsānîdan/ ☜ **خیساندن**

**خیـسی** / xîsî/: /اسم. خووسـاوی؛ تـەڕی؛ شـلی ‹خیسی قالی از شیر سماور است که چکه می‌کند: هـۆی خووسـاوی قالـیەکە شـێری سـەماوەرەکەیە تکـە دەکا›.

**خیسیدن** / xîsîdan/: *مصدر. لازم.* // **خیسیدی:** خووسایت؛ **می‌خیسی:** ده‌خووسی؛ **بِخیس:** بخووسه// خووسیان؛ خووسان؛ فیسیه‌ی: ١. *[نامتداول]* ته‌ڕ بوون؛ له تراویکدا گه‌وزان ٢. خووسیین؛ نه‌رم بوون به‌هۆی ئاو؛ تێرۆ چوونی ئاو ده‌ناو شتێکه‌وه ‹وقتی خوب خیسید، آن را در می‌آوری: کاتێک چاک خووسا، ده‌ری دێنی›. هه‌روه‌ها: **خیسیدنی**

■ صفت مفعولی: **خیسیده** (خووساو)/ مصدر منفی: **نَخیسیدن** (نه‌خووسان)

**خیش** / xîš/: *اسم.* ئاموور؛ هه‌وجاڕ؛ هێش؛ هه‌نجاڕ؛ ئامووێر؛ هێشه؛ هه‌لا؛ کێش؛ هه‌ڤجاڕ؛ دارجفت؛ یه‌رەق؛ گه‌لا؛ ئێره‌ق؛ ئێره‌قه؛ ئامۆ؛ دار؛ باسکه ئاموور؛ ئه‌سپابی جووت؛ داری مابه‌ینی نێر و ده‌نده؛ ئامێری کالانی زه‌وی که ده‌یبه‌ستنه گاوه‌سنه‌وه.

**خیشوم** / xîšûm/: [عربی] *صفت. [نامتداول]* تفنک؛ مفگه؛ فرنک؛ فرتک؛ خمخم؛ ماک؛ بڕناخ؛ بڕناخه؛ کونی لووت؛ کونالووت؛ کونه که‌پو؛ کونا دفن.

**خیشومی** / xîšûmî/: [عربی] *صفت.* تفنکی؛ فرنکی؛ بڕناخی؛ پێوه‌ندیدار به کونی لووته‌وه.

**خیط** / xît (!) ☜ **خیت**

**خیطی** / xîtî (!) ☜ **خیتی**

**خیک** / xîk، ـها/: *اسم.* خیگه (هی به‌ران بۆ جێ ڕۆن)؛ خیگ؛ خیه؛ شورتان؛ شۆرتان؛ پێسته (هی مه‌ڕ بۆ جێ ماست)؛ هیز؛ هه‌لیزه؛ هنگل؛ پۆسپه‌نێر؛ پێستی مه‌ڕ یان بزن که وه‌ک کیسه‌یێکی گه‌پی لێ ده‌که‌ن و تراو، ڕۆن یان په‌نێری تێدا هه‌لده‌گرن.

**خیکی** / xîkî/: *صفت.* ١. خیگه‌یی؛ هه‌ر شتێ له ناو خیگه هه‌لگیرابێ ‹پنیر خیکی: په‌نێری خیگه‌یی› ٢. ـها/ *[مجازی]* خیگه: زۆر چاخ و قه‌له‌و ‹یک مرد خیکی آمد، نشست کنار دستم: پیاوێکی خیگه هات و له په‌نا ده‌ستمه‌وه دانیشت›.

**خیل** / xeyl، ـها/: [عربی] *اسم.* خێل: ١. گه‌له ئه‌سپ ٢. تاقم؛ هۆز؛ تیره؛ ماکاش؛ پۆلی گه‌پ ‹یک خیل مهمان ریختند روی سرمان: خێلێک میوان هاتنه ملماندا›.

**خیلی**[1] / xeylî/: [عربی] *صفت. [گفتاری]* زۆر؛ گه‌له‌ک؛ یه‌کجار؛ فره؛ فریه؛ گوژمه؛ خه‌ولێ؛ زه‌حف؛ زاف؛ خه‌یلێ؛ به هه‌ندێکی گه‌وره‌ی نادیاره‌وه ‹خیلی بزرگ: زۆر گه‌وره›.

**خیلی**[2]: *قید.* زۆر؛ فره؛ فریه؛ یه‌کجار؛ گه‌له‌ک؛ خه‌یلێ؛ زاف؛ فرێو؛ به شێوه‌ی گوژمه یان یه‌ک له دوای یه‌ک ‹خیلی کار کردم؛ خیلی تند می‌رفت: زۆرم کار کرد؛ فره توند ده‌چوو›.

**خیلیها** / xeylîhā/: [عربی/ فارسی] *ضمیر.* زۆرێک؛ گه‌لێک؛ کۆمه‌لێک؛ تاقمێکی زۆر له گرووپێک که ئاماژه‌یان پێ ده‌کرێ ‹خیلیها مردند؛ خیلیها رفتند: گه‌لیک مردن؛ کومه‌لیک ڕۆیشتن›.

**ـخیم** / xîm/: *پیواژه.* ـهێم؛ تایبه‌تمه‌ندی کرده‌وه ‹خوش‌خیم؛ دژخیم: خۆش‌هیم؛ دژهیم›.

**خیمه** / xeyme، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* خه‌رگا؛ شاسه‌یوان؛ خێوه‌ت؛ خه‌یمه؛ جه‌رداخ؛ کۆن؛ هه‌واری؛ چایر؛ چادره؛ چادر، به‌تایبه‌ت گه‌وره‌ی.

⊡ **خیمه زدن:** هه‌لدانی چادر؛ چادر لێدان؛ خێوه‌ت هه‌لدان؛ جه‌رداخ هه‌لداین.

**خیمه‌شب‌بازی** / xeymešab.bāzî، ـها/: [عربی/فارسی] *اسم.* شاسه‌لیم؛ بی بی جان‌خانم؛ بووکه‌له‌وازی؛ شانۆیێک بووکه شووشه‌یی کۆن که به چه‌ن دانه بووکه‌شووشه له سه‌ر شانۆیێکی به‌شێوه‌ی چادره‌وه به‌ڕێوه ده‌چێ و ده‌رهێنه‌ر به گه‌ڕاندن و جوولاندنی بووکه‌شووشه‌کان به هۆی چه‌ند بەنی نادیاره‌وه کار ده‌کا.

**خیمه‌گاه** / xeymegāh، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* هۆبه؛ زۆم؛ هه‌وارگه؛ جێگه‌یه‌ک که چادری تێدا هه‌لده‌درێ.

# د

**د** / d/: *حرف.* د؛ دەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**د**[1] / de/: *اسم.* دێ؛ دال؛ ناوی دەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**د**[2]: *صوت. [گفتاری]* دەی: ١. ئەی؛ دەک؛ تێح؛ پێح؛ حەک؛ حەی؛ عەک؛ نیشانەی سەیر و سەمەرەیی ‹د! پس آن همه پول را چه کردی؟: ئەی! ئەو هەمووە پارەت چی لێکرد؟› ٢. دە؛ دا؛ نیشانەی پێداگری ‹د بیا؛ د نکن؛ د بخور: دە وەرە؛ دەی مەکە؛ دە بخۆ› ٣. نیشانەی بەرهەڵستی ‹د! چرا اینطور می‌کنی؟: دەی! بۆچی وا دەکەی؟›.

**داءالثعلب** / dā'ossa'lab/: [عربی]/*سم.* مووڕێژە؛ مووەڕزە؛ خرکانە؛ نەخۆشی تووک وەرین لە لەشدا.

**داءالرقص** / dā'orraqs/: [عربی]/*سم.* بەرژەنگێکی دەماریە کە لە هەندێک نەخۆشیەوە سەرچاوکە دەگرێ و دەبێتە هۆی هەڵتەکان و هەڵبەزانی شان و جمگەی ڕان (وەک جموجوولی هەڵپەڕکێ).

**داءالصدف** / dā'ossadaf/: [عربی]/*سم.* پیسۆریازیس؛ نەخۆشینی ئاییسان و هەو کردنی پێست بە هۆیەکی نادیارەوە، کە پتر بە شێوەی پوولەکەگەلێکی سپی ئامالْ زێو لە سەر پێستی ئانیشک و ئەژنۆدا دەردەکەوێ.

**داءالفیل** / dā'olfîl/: [عربی]/*سم.* پاگرە؛ پێ مرە؛ نەخۆشی پەنەمانی پا: **پاغُرە؛ پیلپایی**

**داءالکلب** / dā'olkalb/: [عربی]/*سم.* هاری؛ سەگەناز؛ نەخۆشیەکی درمە لە سەگ و گورگەوە دادەکەوێ.

**دائر** / dā'er/: [عربی] ☜ **دایر**

**دائره** / dā'ere/: [عربی] ☜ **دایره**

**دائم** / dā'em/: [عربی] ☜ **دایم**

**دائمی** / dā'emî/: [عربی] ☜ **دایمی**

**دائماً** / dā'eman/: [عربی] ☜ **دایماً**

**دائن** / dā'en/: [عربی] ☜ **داین**

**دائی** / dā'î/: [عربی] ☜ **دایی**

**دات‌پرینتر** / dātperîtner, -pirînter/: [عربی] ☜ چاپگر سوزنی، **چاپگر**

**داخل**[1] / dāxel/: [عربی]/*سم.* ناو؛ ناوەوە؛ دلێ: ١. نێو؛ دەروون؛ هەندروو؛ ناوی هەر شتێ ‹داخل اتاق خیلی گرم بود: ناو دیوەکە زۆر گەرم بوو› ٢. *[کنایی]* ناوخۆ؛ ناوەوەی وڵات ‹در داخل و خارج شناخته شده است: لە ناو و دەرەوەی وڵاتدا ناسراوە›.

◘ **داخل شدن**: چوونە ناو؛ چوونە ناوەوە؛ چوونە ژوورەوە؛ چوونە نێو؛ ڕۆیشتنە ناو؛ لوای دلێ؛ ئەوناو چوون: ١. چوونە ناو شتێ ‹وقتی داخل شد وحشت کرد: کاتێ چووە ژوورەوە تۆقا› ٢. لەگەڵ ڕێکخراوە یان دەستەیەک

هاوکاری کردن یان بەشدار بوون ‹تو هم داخل حزب شدی؟: تۆیش چوویتە ناو حیزبەوە؟›.
**داخل کردن**: تێخستن؛ کردنە ناو؛ خستنە نێو/ ناو؛ ئەنەوسەی؛ وسەینە: ۱. لە ناوەوەی جێگایەک دانان ‹داخل چاه کردن: کردنە نێو بیرەوە› ۲. بەشدار بوون یان خۆ نزیک کردنەوە ‹خودت را داخل این کارها نکن: خۆت مەخە نێو ئەم کارانەوە›.
**داخل**[۲]: *قید.* ۱. لە نێو؛ لە ناو؛ ئەنەدلێ ‹پول داخل کیف است: پارەکە لە نێو کیفەکەدایە› ۲. ناوەوە؛ ژوورەوە؛ دلێ ‹بیا داخل؛ برو داخل: وەرە ژوورەوە؛ برۆ ناوەوە›.
◘ **داخل آدم بودن**: *[مجازی]* کەسێک بوون؛ لە ڕیزی خەڵک، بەتایبەت مرۆڤگەلی بەڕێز و بەبڕدا بوون. هەروەها: **داخل آدم شدن**
**داخل آدم حساب کردن**: بە کەس زانین؛ بە بنیادەم حساب کردن؛ بۆ کەسێ ڕێز و بایەخ دانان ‹آزاد او را داخل آدم حساب نمی‌کرد که نظرش را بپرسد: ئازاد ئەوی بە کەس نەدەزانی تا بیر و ڕای لێبپرسێ›.
**داخله**[۱] / dāxele/: [عربی]*اسم.* ناوخۆ؛ هەندروو ‹اوضاع داخله ناآرام است: دۆخی ناوخۆ ئاڵۆزە›.
**داخله**[۲]: *صفت.* ناوخۆیی؛ دەروونی ‹چای داخله: چایی ناوخۆیی›.
**داخلی** / dāxelî/: [عربی] *صفت.* ناوخۆیی: ۱. پێوەندیدار، هاوگەر یان بەندیوار بە ناوەوە ‹سیاست داخلی: سیاسەتی ناوخۆیی› ۲. ناوەکی؛ ناوەوە؛ هەڵکەوتوو لە ناوەوە ‹فضای داخلی: بۆشایی ناوەکی›.
**داد** / dād/: *اسم.* داد؛ دای؛ داو: ۱. *[ادبی]* پاراستن یان بەڕێوەبردنی ئەوەی دروستە، بەتایبەت بە داوەری بێ‌لایەنانە لە نێوان لاینگەل یا خود دەستنیشان کردنی پاداش و سزیای شیاو ۲. *[ادبی]* ماف؛ حەق؛ بەشێک کە هەر کەس بە هۆی گەلەمپەری یان قانوونەوە پێی دەدرێ ۳. *[گفتاری]* هەلا؛ هەرا؛ هاوار؛ دەنگی بە قەو.
◘ **داد دادن**: *[ادبی]* ماف دان؛ داد دان؛ حەق دان؛ نەهێشتنی ناحەقیکاری؛ دانی داد بە خاوەنی ڕاستەقینەی.
**داد زدن**: *[گفتاری]* ۱. هاوارکردن؛ هەراکردن؛ نەڕاندن؛ قێڕاندن؛ قیراندن؛ زرچایش؛ نەڕای؛ قیڕنەی ۲. ☜ **داد کشیدن**
**داد سخن دادن**: وتاردان؛ وتاربێژی کردن؛ وتەوانی کردن؛ باش داخێویان لەمەڕ مەبەستێکەوە.
**داد کردن**: *[ادبی]* دادکردن؛ دادگەری کردن؛ بە گوێرەی قانوون یان ماف، کار کردن.
**داد کسی بلند شدن/ به هوا رفتن**: *[گفتاری]* هاواری کەسێک بەرز بوونەوە؛ هاوار لە کەسێ هەڵسان/ بەرز بوونەوە ‹تا دست روی بازویش گذاشتم دادش بلند شد: هەر دەسم نایە سەر باسکی هاواری بەرزەوە بوو›.
**داد کسی را درآوردن**: دەنگی کەسێ دەرهێنان؛ دەنگوو یۆی ئاردەی ‹آن قدر پیله کرد تا داد مرا درآورد: هێندەی هەڵپێچام، دەنگی دەرهێنام›.
**داد کشیدن**: *[گفتاری]* هاوارکردن/ کەردەی؛ نەڕاندن؛ قێڕاندن؛ قیراندن؛ زرچایش ‹داد می‌کشید و کمک می‌خواست: هاواری دەکرد و یارمەتی دەویست›: **داد زدن**
**داد گستردن**: *[ادبی]* دادگێڕان؛ داد پەروەراندن؛ داد بەخشین؛ مافی مەردم دابین کردن؛ دادگێڕی کردن.
**به داد کسی رسیدن**: فریای کەسێ کەوتن؛ گەیینە فریای کەسێ؛ بۆ یارمەتی کەسێک چوون؛ بە هاواری کەسێکەوە چوون؛ چوونە هانای کەسێکەوە؛ یاوەی دادوو یۆیوە ‹اگر به داد او نرسیده بودم غرق می‌شد: ئەگەر فریای نەکەوتبام ئەخنکا›.

**دادائیسم** / dādā'îsm /: [فرانسوی]/اسم. دادایيسم؛ رێبازێکی هونەری کە لە دەکانی سێیەمی چەرخی بیستەم، لە ئورووپای ڕۆژئاوادا پەرەی ساند و لە سەر نەهێشتنی بنەماگەلی باوی نێوکۆمەڵگا پێداگری دەکرد.

**دادار ـ دودور** / dādārdudûr /: /اسم. ۱. [گفتاری] شات و شووت؛ لاف و گەزاف؛ خۆ هەڵکێشان بە هەرا و هوریاوە ۲. [کنایی] کاسە و کەوچک؛ ئەسپاو؛ دوودووله؛ ئەندامی زاوزێ نێرینە.

**داداش** / dādāš ، ـها /: [ترکی]/اسم. برا؛ ئابرا؛ ئابا؛ کاکە؛ کاک: ۱. [گفتاری] برادەر؛ برالە؛ براڵە 〈داداش، مواظب باش!: برا، هۆشت بێ!〉 ۲. لاوژا؛ داش؛ کاکەبرا؛ ئاغەبرا (زۆرتر برای گەورە) 〈داداش من کارگر آنجاست: کاکەم کارگەری ئەوێیە〉.

**دادپرور** / dādparvar ، ـها /: صفت. دادپەروەر؛ دادبەخش؛ عادڵ؛ خاوەن داد.

**دادخواست** / dādxāst ، ـها /: /اسم. داخواز؛ داوخواز؛ دادخواز؛ سکاڵا؛ سکاڵە؛ سکاڵانامە؛ شکاتنامە؛ نامەی شکات بردنە بەر دادگا کە تێیدا نووسەر خوازیاری پێڕاگەیشتنێک دەبێ.

**دادخواه** / dādxāh /: صفت. دادخواز؛ دادبەر؛ سکاڵابەر؛ سکاڵەبەر؛ داوخوازکەر؛ شکایەتکەر؛ گلیکار.

**دادخواهی** / dādxāhî ، ـها /: /اسم. داوخوازی؛ دادخوازی؛ گازن؛ هانابەری؛ ڕۆیشتن بۆ جێگەی دادپرسی بۆ گرتنی ماف.

**دادرس** / dādres ، ـها؛ ـان /: /اسم. دادپرس؛ دادوەر؛ قازی؛ کەسێ کە بە داخوازی گازندەکەر ڕادەگا و دروست یان نادروستی داخوازەکەی ڕوون دەکاتەوە.

**دادرسی** / dādresî /: /اسم. دادپرسی: ۱. /ـها/ کار یا ڕەوتی ڕاگەیشتن بە سکاڵای سکاڵابەر و ڕوونکردنەوەی دروستی یان نادروستیان، بەتایبەت لە لایەن بەرپرسی ڕەسمیەوە (وەکوو دادوەر) 〈جلسەی دادرسی بە شکایت مالکان تشکیل شد: دانیشتنی دادپرسی بە داخوازی مالکەکان پێک هات〉 ۲. یانەی دادپرسی؛ ڕێخراوەیێ کە ئەم کارەی لە ئەستۆدایە 〈دادرسی ارتش: دادپرسی ئەرتەش〉.

**دادستان** / dādsetān ، ـها؛ ـان /: /اسم. دادسێن؛ دادسان؛ دادستان؛ مافزانێ کە لە لایەن دەوڵەتەوە بەرپرسی ئاگاداری لە کۆمافی کۆمەڵگا، ڕاگەیشتن بە سەر درووس جێبەجێ بوونی قانوون و وەدووکەوتنی سەرپێچکاران بە یارمەتی دادگایە.

**دادستانی** / dādsetānî /: /اسم. ۱. دادسانی؛ دادستانی 〈دادستانی دادگاه مطبوعات: دادسانی دادگای ڕۆژنامەکان〉 ۲. /ـها/ ژووری داد؛ دەفتەری کاری دادستان.

**دادسرا** / dādsarā ، ـها /: /اسم. یانەی داد؛ مەزرینگەیەک کە دادستان و کارگێڕەکانی تێیدا کار دەکەن 〈او را بە دادسرا احضار کردند: بانگیان کرد بۆ یانەی داد〉.

**دادگاه** / dādgāh ، ـها /: /اسم. دادگا: ۱. دادگە؛ جێگایێ کە دادپرس یا دادپرسان لەگەڵ دادستاندا بە گازنی سکاڵابەران ڕادەگەن؛ جێگەی سکاڵا بۆ بردن ۲. [گفتاری] دادپرسی؛ دادگایی 〈فردا دادگاه داریم: بەیانی دادگامان هەیە〉.

▣ **دادگاه اداری**: دادگەی مەزرینگەیی؛ دادگای کارگێڕی؛ دادگای ئیداری؛ دادگەیێ کە لە ئیدارەیەکدا بۆ پێڕاگەیشتن بە سەر هەڵەکاری و سەرپێچی کارگێڕان پێک دێت.

**دادگاه ارتش** ☜ **دادگاه نظامی**

**دادگاه استیناف**: دادگای لە سەر گرتنەوە؛ دادگای پێداچوونەوە؛ دادگای لێکۆڵینەوە: **دادگاه تجدیدنظر**

**دادگاه انتظامی**: دادگایێ کە لە لایەن ئەندامانی تاقمێک یان پیشەیەکی کۆمەڵگاوە بە مەبەستی پێڕاگەیشتن بە چەوتی و سەرپێچی ئەندامەکانیەوە پێک دێت.

**دادگـاه انقـلاب:** دادگـای شـۆرش؛ دادگـای ڕاپـەڕین؛ دادگایـێ کـه لـه لایـەن ڕێبـەرانی ڕاپەڕینەوە بـۆ دادگـایی‌کـردنی نـەیاران و دژ هەڵویستان پێک‌دێ.

**دادگاه انکیزیـسیون:** دادگـای ئەنکیزیـسیون؛ دادگایێ که لـه وڵاتـانی ئورووپـای ڕۆژاوا لـه سـەدەکانی ١٥تـا ١٧ی زایینیـدا، لـه لایـەن کلێسای کاتولیکەوە بۆ پـشکنینی بـیر و ڕای خەڵک و ڕاوەدوونانی نەیارانی کلێسا دامەزرا.

**دادگاه بَدْوی:** دادگەی سـەرەتایی؛ دادگایـێ که به چۆناوچۆنی کێـشه و شـیاوی دادگاکـه ڕادەگا.

**دادگاه تجدیدنظر** ☜ **دادگاه استیناف**

**دادگاه صحرایی:** دادگای سەرپێیی؛ دادگەیێ که هاوکات لەگـەڵ گـیرانی تاوانبـار و بـەبێ تێپەڕانی قۆناغگەلی پێویست پێک‌دێ و بڕیار دەدا و ڕێوڕا جێبەجێی دەکا.

**دادگاه نظامی:** دادگـای چەکـداری؛ دادگـای سەربازی؛ دادگایێ که بـه تـاوانی چەکـداری ڕادەگا: **دادگاه ارتش**

**دادگاهی** / dādgāhî/: *صفت. [گفتاری]* دادگـایی؛ ناچار به ئاماده بوون له دادگادا بۆ دادگایی‌کردن ‹فرمانده گفت: «می‌دهم دادگاهی‌ات کننـد»: فەرمانـده گوتی: «ئەتدەم دادگاییت کەن»›.

◘ **دادگـاهی کـردن:** دادگـایی‌کـردن؛ کێـشانه دادگا؛ ئەنه دادگا کێشتەی.

**دادگر** / dādgar ، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* دادگـەر؛ دادگێڕ؛ دادپەروەر؛ دادبەخش؛ خـاوەن ئاکـاری سازگار لەگەڵ قانووندا.

**دادگـری** / dādgarî/: *اسـم. [ادبـی]* دادگـەری؛ دادگێڕی؛ دادپەروەری؛ دادبەخـشی؛ کـارکردن به پێی داد له سەر قانوون.

**دادگـستر** / dādgostar ، ـان/: *صفت. [نامتـداول]* دادپەروەر؛ هۆگری بەرامبەری و له دووی پـەره دان به داد و یەکچاوڕوانی.

**دادگـستری** / dādgostarî/: *اسـم.* ١. /ـهـا/ وەزارەتی داد؛ وەزارەتخانەیێ که کـار و ئـەرکی پێڕاگەیـشتن بـه سـکاڵای ناحـەقی لێکـراوان و دانانی ڕادەی جزیا و تەمێ بۆ ملهوڕانه بەرامبـەر به قانوون ٢. /ـها/ دادسـەرا؛ یانـەی داد؛ هـەر یەکـه لـه لقگـەلی ئـەو وەزارەتخانەیـه لـه پارێزگاکـان، کـه بەرپرسـی ئـەم کارەیـه ٣. *[نامتـداول]* دادپـەروەری؛ کـار یـان ڕەوتی پەرەپێدانی داد.

**دادن** / dādan/: *مصدر. متعدی. لازم.* // **دادی:** دات؛ **می‌دهی:** ئـەدەی؛ **بِـدِه:** بـده// دان؛ وەدان؛ دایـن؛ دایین؛ یان؛ دای؛ دەی: ◘ *متعدی.* ١. شـتێ بـه یەکێ بەخشین ‹گلها را به او دادم؛ به مـن پـول داد: گوڵـەکانم پـێ دا؛ پـارەی پـێ‌دام› ٢. هـەڵێ بـۆ دیتری ڕەخساندن ‹راه دادن؛ بـار دادن: ڕێ دان؛ بار دان› ٣. بار و دۆخـێ پێـک هێنـان ‹چین دادن؛ جوش دادن: چین دان؛ جۆش دان› ٤. هێنانه پێش چاو بۆ لێ‌ڕوانین ‹نشان دادن؛ نمایش دادن: پیـشان دان؛ نومایش دان› ٥. پێدان؛ بـه سـەردا هێنـان؛ سـەپاندن؛ داسـەپاندن؛ بارکـەردەی؛ پنـەدەی ‹گرسـنگی دادن: برسـیەتی پـێ‌دان› ٦. دانـان بـۆ فرۆش ‹توی میدان اینها را می‌دادند به صد تومـان: لـه مەیداندا ئەمانەیان دەدا به سەد تمەن› ٧. به کارێ هەڵـپێچاندن ‹بدهیـد درش را ببندنـد؛ فرمـان دادن: بیدەن دەرگاکەی گاڵـەکەن؛ فـەرمان دان› ٨. بـه خوارد دانی شتێـک ‹به بچه شیر دادن؛ بـه گلهـا آب دادن: شیر به منداڵ دان؛ ئاوی گوڵ دان› ٩. کردنه هاوسـەری پیاوێـک ‹دخترشـان را دادنـد بـه پـسر همـسایه؛ شـوهر دادن: کچەکـەیان دا بـه کـوڕی دراوسێکەیان؛ به شوو دان› ◘ *لازم.* ١٠. بەدیهاتن؛ وەدیهـــاتن ‹محـــصول دادن: داهـــات دان› ١١. دەڵان؛ نمتک‌کـردن ‹سماور آب مـی‌داد، دادم درستش کننـد: سەماوەرەکه ئاوی دەدا، دام دروسـتی کەن› ١٢. کردی هاوکرد ‹جا دادن؛ رو دادن: جـێ دان؛ ڕوو دان›. هەروەها: **دادنی**

■ صفت فاعلي: دهنده (ـ)/ صفت مفعولي: داده (دراو)/ مصدر منفي: نَدادن (نەدان)

**دادنامه / dādnāme** ، ـها/:/سم. دادنامە؛ بڕیارێ کە لە لایەن دادگاوە دەردەچێ ‹بە موجب این دادنامە باید یک سال در زندان باشید: بە پێی ئەم دادنامەیە ئەبێ ساڵێ لە گرتووخانە بن›.

**داد و بیداد / dād-o-bîdād**:/سم. هات و هاوار؛ هەرا و هەنگامە؛ هەرا و هوریا؛ داد و بێداد؛ داو و بێداو؛ زەنا ـ زەنا؛ گرێچ؛ هاوار و هەلا، نەخوازە بۆ بەرهەڵستی، پلەندەری یان دادخوازی.

▣ داد و بیداد راه انداختن: داد و بێدادکردن؛ داو و بێداوکردن؛ هەرا و هوریا ڕێخستن ‹چرا سر هیچوپوچ این قدر داد و بیداد راه انداختی؟: بۆچی لە خۆڕایی ئەم هەموو داد و بێدادە دەکەی؟›.

هەروەها: **داد و بیداد کردن**

**دادوستد / dād-o-setad**:/سم. داوسەت؛ دان و سان؛ دان و سەندن؛ سەودا و مامەڵە؛ ئاڵشت؛ ئاڵش و وێرش؛ واروگۆڕ؛ فاروگۆڕ؛ ئاڵوویر: ١. کار یان ڕەوتی گۆڕانەوەی شتومەک یان پارە ٢. بدە و بسێنە؛ بدە و بێنە؛ ئەو پەیوەندیە کە بەم بۆنەوە پێکدێ ‹با آنجا تاکنون دادوستد نداشتەایم: تا ئێستە لەگەڵ ئەوێدا داوسەتمان نەبووە›.

**داد و فریاد / dād-o-faryād**:/سم. هاوار و داد؛ هەرا و هاوار؛ دای و فەریای؛ قوولاقوول؛ هەلا؛ قرم و قاڵ؛ هەرا و مەزات؛ چەقە و گۆڕ.

**داد و قال / dād-o-qāl**: [فارسی/ عربی]/سم. [گفتاری] چەقە و هەرا؛ هەرا و زەنا؛ زەنا ـ زەنا؛ قایش؛ گۆنگەشە؛ کێشە و هەرا؛ قیرە و هەرا: **داد و هوار**

**دادوهوار / dād-o-havār** ☜ **داد و قال**

**داده / dāde** ، ـها/:/سم. دەیتا؛ دراوە؛ زانیاریەکی ڕاستەقینە و کردەوەیی (وەک ئەندازە یان ژمێرکۆ) لە هەر شتێک کە دەبێتە بنەمای بۆچوون، لێکۆڵینەوە یان هەژماردن ‹دادەهای آماری: دراوەی ژمێرکۆیی›.

**دادهآمایی / dāde'āmāyî**:/سم. کار یان ڕەوتی بەرهەڤکردنی ئاگاداریگەل: **آمایش دادەها**

**دادهپردازی / dādepardāzî**:/سم. کار و ڕەوتی دەرهێنانی دراوەگەلی دەکارنەکراو بە شێوەی شیاوی خوێندنەوە و کارکردن لە سەریدا بە کەمپیوتەر.

**دادهورزی / dādevarzî**:/سم. ئەنفۆرماتیک؛ زانستی کۆکردنەوە و لێکدانەوەی زانیاری بە یارمەتی دەزگای ئەلکترۆنیکی و کەمپیوتەری.

**دادیار / dādyār** ، ـها؛ ـان/:/سم. دادیار؛ جێگری دادستان.

**دار[1] / dār** ، ـها/: [از کردی]/سم. ١. [ادبی] دار؛ درەخت ٢. [نامتداول] چێو؛ چۆ؛ دار ٣. داروبار؛ دار؛ چوارچێوەی بۆ چنینی دەستی ٤. سێدارە؛ قەنارە؛ دار؛ داری خنکاندنی تاوانبار ٥. [عربی] [نامتداول] ماڵ؛ یانە؛ خانوو؛ جێگای ژیان.

▣ دار اعدام: سێدارە؛ قەنارە؛ دار؛ داری پێخنکاندنی تاوانبار.

**دار دنیا/ فانی**: [کنایی] ماڵ؛ سامان؛ ژیان ‹از دار دنیا همین یک پسر را داشت: لە ماڵی دنیا هەر ئەو کوڕەی بوو›.

**دار غرور**: [ادبی] دنیا؛ بەرامبەری قیامەت.

**دار قالی**: دار تەون؛ دار تەڤن؛ دار و بار؛ ئامرازێک بە شێوەی چوارچێوە کە تەونی لە سەر دەکەن. هەروەها: **دار جاجیم؛ دار گلیم**

**دار مکافات**: دنیا؛ ئەم دنیایە تێدا دەژین.

▣ دار زدن: لە سێدارە دان؛ لە دار دان؛ لە قەنارە دان؛ خنکاندنی کەسێک بە هەڵواسینی لە سێدارە ‹امروز صبح دو قاتل را دار زدند: ئەم بەیانیە دوو پیاوکوژیان لە سێدارە دا›:

**به دار آویختن/ کشیدن**

**دار فانی را وداع گفتن**: [کنایی] کۆچی دوایی کردن؛ مالاوایی یەکجاری کردن؛ چاو لێکنان؛ مردن ‹نالی در سال ۱۲۷۳(هـ .ق.) دار فانی را وداع

گفت: نالی لە سالی ١٢٧٣(ک. م.)دا کۆچی دوایی کرد›.

**بە دار آویختن/ کشیدن** ☜ **دار زدن**

**دارـ**[2]: پیشواژە. دارـ ؛ چێو ‹داربست: داربەس›.

**ـــ دار**[3]: پیواژە. ـ دار: ١. درەخت؛ بەتایبەت چێوەکەی ‹سپیدار: سپیدار› ٢. بەـ ؛ دارا؛ دارندە ‹پدردار؛ پولدار: باوکدار؛ پارەدار› ٣. بەڕێوەبەر ‹مغازەدار؛ خانەدار: دووکاندار؛ ماڵدار›.

**دارا** / dārā/: صفت. دارا: ١. خاوەن ‹دارای قدرت: خاوەن هێز› ٢. /ـها/ دەوڵەمەند؛ بوودە؛ زەنگین؛ مرۆی زەنگین و ماڵ خۆش ‹پدر دختر خیلی دارا است: باوکی کچەکە زۆر دارایە›.

**دارائی** / dārā'î/ ☜ **دارایی**

**دارابی** / dārābî ، ـها/: اسم. دارابی؛ سندی: ١. دارێکی شەتڵی لە تیرەی نارنج بە میوەی مێخۆش و زەرد ڕەنگەوە ٢. میوەی ئەو دارە.

**دارالتأدیب** / dārotta'dîb/: [عربی]/اسم. [قدیمی] کانون اصلاح و ترتیب ☜ **کانون**

**دارالتجاره** / dārottecāre ، ـها/: [عربی]/اسم. [قدیمی] یانەی دانوسان؛ نووسینگەی بازرگانی.

**دارالتربیه** / dārottarbîye ، ـها/: [عربی]/اسم. [قدیمی] پەروەرشتگا؛ پەروەرشتگە.

**دارالترجمه** / dārottarcome ، ـها/: [عربی]/اسم. یانەی وەرگێڕان؛ جێگایێ کە نووسراوەی تێدا لە زمانێکەوە بۆ زمانێکیتر وەردەگێڕن.

**دارالحکومه** / dārolhukûme, -hokûme ، ـها/: [عربی]/اسم. [قدیمی] دیوانی دەسەلات ‹او را کشان‌ـکشان بە دارالحکومە بردند: بە کێشەکێش بردیانە دیوانی دەسەلات›.

**دارالسلطنه** / dārossaltane ، ـها/: [عربی]/اسم. [قدیمی] پاتەخت؛ پایتەخت؛ تەخت؛ شارێ کە ناوەندی بەڕێوەبەرایەتی و دەسەلاتداری دەوڵەتێکی تێدایە.

**دارالشورا** / dāroššûrā ، ـها/: [عربی]/اسم. [قدیمی] ڕاوێژگا؛ ڕاوێژگە؛ جێگەی تەگبیر لێ‌کردنەوە.

**دارالفنون** / dārolfunûn, -fonûn ، ـها/: [عربی] اسم. [قدیمی] یانەی زانیاری.

**دارالمجانین** / dārolmacānîn ، ـها/: [عربی]/اسم. [قدیمی] شێت‌خانە؛ دینگە؛ نەخۆشخانەی ڕەوانی.

**دارالمعلمین** / dārolmo'allemîn ، ـها/: [عربی] اسم. [قدیمی] خوێندنگەی مامۆستایان؛ یانەی مامۆستایان.

▣ **دارالمعلمین عالی**: [قدیمی] خوێندگەی بالای مامۆستایان.

**دارالوکاله** / dārolvekāle ، ـها/: [عربی]/اسم. نووسینگەی بریکاری؛ بنکەی بریکاری.

**دارایی** / dārāyî ، ـها/: اسم. دارایی: ١. دار؛ وار؛ دەوڵەت؛ سامان؛ ماڵ؛ هەدار؛ پارە، کالا یان ملکێ کە کەسێ یان مەزرینگەیەک لە بەر دەستیدایە ٢. وەزارەتێ کە وەرگرتنی پیتاک و خڕکردنەوەی داهاتی دەوڵەت و دابین‌کردنی خەرجی دەوڵەتی لە ئەستۆدایە ٣. هەر یەکە لە لقگەلی ئەو وەزارەتە لە شاراندا ✻ **دارائی**

▣ **دارایی ثابت**: سامان؛ ئامێرگەلێ کە بۆ هەڵسووڕانی کارێکی بازرگانی پێویستن و بە شێوەی هەمیشەیی کەڵکیان لێ وەردەگیردرێ (وەک زەوین، خانووبەرە، کەلپەل و...).

**دارایی جاری**: ئەوەی کە لە ڕەوتی چالاکی بازرگانی و دان و ساندایە (وەک پارە، بەڵگەی ماڵی، پەڕەی بایەخدار و کالا و...).

**دارایی غیرمنقول**: ماڵێ کە نەتوانرێ جێبەجێ بکرێ (وەک زەوین، خانوو، باغ، دووکان). هەروەها: **دارایی منقول**

**دارایی نامشهود**: ئەو جۆرە داراییە کە هەیە، بەلام لە ڕەوتی دان و ساندا نیە (وەک سەرقوفڵی، مافی سەربەشانە و...).

**داربست** / dārbast ، ـها/: [کردی]/اسم. داربەند: ١. داربەس؛ داربەست؛ چێوبەس؛ چێوبەست؛

چووبەس؛ دارئەلوەس؛ قەرچێو؛ کەپرۆکە؛ چەوتەک؛ تۆڕێک لە تیرگەلی چێوی یان کانزایی بۆ کارکردن لە بیناگەلی بەرز و دەس پێڕانەگەیشتوو (وەک سەر دیوار یا نهۆمگەلی سەرووی وارخان) کە بە شێوەی ئەستوونی و ئاسۆیی پێکەوە دەبەسرێنەوە ٢. دالووت؛ دالیت؛ کوڕەدار؛ کەپر؛ کەپرە؛ هەرزاڵ؛ هەرزەلە؛ پێکهاتەیەکی هاوسان کە هەر وەک پاڵگەیەک بۆ رووەکی هەڵپێچەر (وەک مێو) بە کار دەڕوا.

**دارت** / dārt ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. دارت؛ کەرەسەیەکی نووک‌تیژ و پەڕەدار کە دە یاریدا بەرەو پەڕەیەک دەیهاوێژن.

**دارچسب** / dārčasb ، ـها؛ ـان/: [کردی]/اسم. هەر کام لەو گیایانە کە بۆ گەشەکردنی بە پالگەیەکەوە (وەک دار، بەرد، دیوار) دەنووسن و پێیدا هەڵدەکشن (وەک لەولاو).

**دارچین** / dārčîn ، ـها/: [کردی]/اسم. دارچین؛ دارچینی؛ توونەدار؛ توێکڵەدارێکی تیژ و بۆنخۆشە بە ڕەنگی قاوەیی کاڵ، بۆ تام و چێژە خۆش‌کردن لە چێشتی دەکەن.

**دارچینی**[1] / dārčînî/: [کردی]/اسم. دارچینی؛ ڕەنگ دارچین؛ ڕەنگی قاوەیی ڕۆشنی سوورکار. هەروەها: **دارچینی‌رنگ**

**دارچینی**[2]: صفت. دارچینی: ١. بە ڕەنگی قاوەیی ڕۆشنی سوورکار ٢. بە تامی دارچین ‹آدامس دارچینی: بنێشتی دارچینی›.

**دارحلقه** / dārhalqe ، ـها/: [کردی/ عربی]/اسم. [ورزش] دارئالقە؛ دووئالقەی وەک یەک کە بە مەودایەکی ڕەچاوکراو لە بارفیکسەوە هەڵواسراون و لە ژیمناستیکدا بە کار دەڕۆن.

**داردوست** / dārdûst ، ـها/: [کردی/ فارسی]/اسم. گوڵەسەرکێش؛ گوڵە چەسپی.

**دارکاله** / dārkāle/: [کردی]/اسم. چۆگان؛ گۆچان؛ گۆپاڵ؛ داردەستی سەرخوار.

**دارکوب** / dārkûb/: [کردی/ فارسی]/اسم. دارکۆ؛ دارکوە؛ دارکوکە؛ دارەکەوە؛ دارکوت؛ دارکوتە؛ دارکوتکە؛ دارکۆرک؛ دارکرۆکە؛ دارکونکە؛ دارکونکەرە؛ دارشکنک؛ دارنسب؛ درەخت‌سنبە؛ داربڕ؛ دارتورکنە؛ دارتورکنەک؛ دارەسمە؛ دارسمەک؛ دارسمنەک؛ دارتەقنە؛ دارتەقێنە؛ کوویک؛ بەدکورە؛ کاکورک؛ کوتکوتۆک؛ تەوتەپە؛ چکووچک؛ دارکوتکە؛ خەنجەرەدەم؛ خەنجەرەدەمە؛ قیقی؛ تیرەیەک لە باڵندەگەلی دارژی، پەل ڕەنگین، بە دەندووکی تیژ و گورێخەوە کە بۆ دۆزینەوەی کرم و مێروو، دار دەکۆڵن، نێرەکان تاجێکی سووریان هەیە.

**دارمرز** / dārmarz/: [کردی]/اسم. ئەندازەیەک لە بەرزایی دە ناوچەیەکدا کە لەوە سەرتر دار شین نابێ.

**دارندگی** / dārandegî/: /اسم. دارندەیی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی دارا بوون.

**دارو** / dārû ، ـها؛ ـجات/: /اسم. ١. دەرمان؛ دەوا؛ دەرموو؛ دەرمانک؛ ئەوەی بۆ چارەکردنی دەرد یا بەرگری لە نەخۆشی یان بەهێزکردنی لەش بەکاردەچێ ٢. ماکی کیمیایی ✽ **دوا**

▣ **داروی بیهوشی**: دەوای بێهۆشی؛ دەرمانی بێهۆشی.

**داروی دباغی**: هەلالە؛ هەلال؛ دەرمانی پێست و چەرم خۆش کردن.

**داروی ژنریک**: دەوای ژینێریک؛ دەوای بەبێ ناوی بازرگانی.

**داروی گیاهی**: دەوای گیایی؛ دەوایێ کە ڕاستەوخۆ و بە بێ‌کەڵک‌گرتن لە ڕەوتی کیمیایی لە ڕووەک وەردەگیرێ (وەکوو گوزروان، ڕکێشە و ئاوی بۆژانە).

**داروی مسهل**: ڕەوێنەک؛ بڕوێن؛ قـژۆکەر؛ ڕەوانکەر؛ دەرمانی ڕەوان‌کردنی ڕێخۆڵە.

**داروی نظافت**: واجبی.

**دارواش** / dārvāš ، ـها/: /اسم. دەمووکە؛ دەمووکانە؛ دمکانە؛ دارخوەرک؛ چەسپەلووک؛

ڕووەکێکی مشەخۆری هەمیشە سەوزە لە سەر درەختی بەردار دەژی، ماکێکی ڕێسینی لێ دەردەهێنرێت و بۆ مەبەستی بژیشکیش بەکار دێت.

**داروئی** / dārû'î/ ☜ **دارویی**

**داروپزشکی** / dārûpezeškî, -pezešgî/:*اسم.* دەوابژیشکی؛ لقێک لە زانستی بژیشکی کە لە سەر تێکەڵاوی دەرمان و کارتێکەرییان دەکۆڵێتەوە.

**داروخانە** / dārûxāne ، ـها/:*اسم.* دەواخانە؛ داروخانە: ۱. ئەجزاخانە؛ دەوایگا؛ دووکانی دەرمان فرۆشتن ۲. دەرمانگە؛ شوێنێ لە دامەزرەوایێ (بەتایبەت نەخۆشخانە) بۆ هەڵگرتن و گەیاندنی دەوا بە نەخۆشان.

**داروخانەچی** / dārûxāneči ، ـها/: [فارسی/ ترکی]*اسم. [گفتاری]* دەواخانەدار؛ دەرمانفرۆش؛ ئەجزاچی.

**داروخانەدار** / dārûxānedār ، ـها؛ ـان/:*اسم.* دەواخانەدار؛ دەرمانفرۆش؛ ئەجزاچی.

**دارودرخت** / dār-o-deraxt/:[کردی/ فارسی] *اسم. [گفتاری]* دار و دەرخت (بە کۆمەڵ) ‹حیاطشان بد نبود، دار و درخت هم داشت: حەوشەکەیان خراپ نەبوو، دار و درەختیشی هەبوو›.

**دارودرمانی** / dārûdarmānî/:*اسم.* داروودەرمانی؛ کار یان ڕەوتی دەرمانی نەخۆشی بە دەوا.

**دارودسته** / dār-o-daste/:[کردی/ فارسی]*اسم. [تعریض]* دارودەستە؛ دارودەسە؛ دەسە و بەسە؛ دەس و پێوەن؛ دەست و پێوەند؛ ڕەشەک؛ تابوون؛ کۆمەڵێک کە بۆ ئامانجێکی دیاریکراو کۆ دەبنەوە (وەکوو ئەنجومەن، حیزب و...) ‹در سال ۱۳۵۷ هر کس برای خودش یک دار و دسته راه انداخته بود: لە ساڵی ۱۳۵۷دا هەر کەسێ بۆ خۆی دارودەستەیەکی ڕێخستبوو›.

**داروساز** / dārûsāz ، ـها؛ ـان/:*اسم.* دەواساز؛ دەرمانساز: ۱. کەسێ کە کاری تێکەڵ کردنی ماکی جۆراوجۆر بۆ سازکردنی دەرمانە ۲. کەسێ کە وانەی دەواسازی خوێندووە.

**داروسازی** / dārûsāzî/:*اسم.* دەواسازی؛ دەرمانسازی: ۱. زانستێ کە بە لێکۆڵینەوەی کارکۆیی، کارتێکەری و چۆنیەتی دروست کردنی دەواوە دەپەرژێ ۲. کار یان ڕەوتی دروست کردنی دەوا.

**داروشناسی** / dārûšenāsî/:*اسم.* دەواناسی؛ دەرمان‌ناسی؛ زانستی پێوەندیدار بە ناسینی دەوا، بنەما، تیکەڵاوی، کارتێکەری، ڕێژە و چۆنیەتی بە کار بردنیان.

**داروغە** / dārûqe ، ـها/: [ترکی]*اسم. [قدیمی]* داروغە؛ دارغە؛ درقە؛ قولچی شار؛ سەرپەرشتی پاسەوانان.

**داروفروش** / dārûfurûš ، ـها؛ ـان/:*اسم.* دەرمان‌فرۆش؛ دەوافرۆش؛ کەسێ کە کاری کڕین و فرۆشتنی دەوایە.

**داروک** / dārovak ، ـها؛ ـان/:*اسم.* بۆقی سەردار؛ قورواق داری.

**داروگر** / dārûgar ، ـان/:*اسم.* هەتوانچی؛ کەسێ کە لەگەڵ دەوادا (ناسین، دروست کردن یان فرۆشتنی) سەروکاری هەیە، بەتایبەت دەواناس.

**دارونەدار** / dār-o-nadār/:*اسم. [گفتاری]* دار و نەدار؛ سەر و ماڵ؛ هەموو ملک و ماڵی کەسێک ‹همەی دار و ندار من همین خانە است: تەواوی دار و نەدارم هەر ئەم ماڵەیە›.

**دارونما** / dārûnemā ، ـها/:*اسم.* دەوانوێن؛ شتێ (وەکوو حوب) کە لە دەوا دەکا، بەڵام ماکی دەرمانی و کیمیایی تێدا نیە و زۆرتر بۆ هەدا گرتنی نەخۆشی ڕەوانی یان بۆ دیاری‌کردنی کارتێکەری دەوایەکی تایبەت بە کار دەڕوا.

**داروینیست** / dārvînîst ، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* دارڤینیست؛ داروینیست؛ هۆگر و پەیگری دارڤینیسم.

**داروینیسم** / dārvînîsm ، ـها/: [فرانسوی]*اسم.*

دارڤینیسم؛ ئامۆژەی هاوگەر بە چارلز دارڤین (۱۸۰۹ـ۱۸۸۲ زایینی) سروشتزانی ئینگلیزی کە بنەمای بیر و بۆچوونی بڕوا بە گووڕانی گیانداران لە ساناوە بۆ ئاستەنگ و هەروەها بڕوا بە مانەوەی تۆرەمەی لەبارتر و هەبوونی ڕەوتی سازگاری و بازدان لە گیانداراندایە.

**دارویی** / dārûyî/: *صفت.* دەوایی؛ دەرمانی؛ پێوەندیدار یان سەر بە دەوا و دەرمانەوە ‹بنگاه دارویی: بنکەی دەوایی›: **داروئی**

**ــ داری** / dārî/: *پیوازه.* ــ داری: ۱. کار یان ڕەوتی بەڕێوە بردن ‹باغداری؛ کشورداری: باخداری؛ ولاتداری› ۲. کار یان پیشە ‹قپانداری: قەپانداری› ۳. ـ/ها/ مەزرینگە یان جێگایەک پێوەندیدار بە پیشە یان کارەوە ‹دامداری: ئاژەڵداری›.

**داریه** / dār(i)ye ، ـها/: [از عربی] *اسم. [گفتاری]* ۱. دایرە ۲. دەف.

**داریه ـ دنبک** / dār(i)yedombak, -donbak/: [از عربی/ فارسی] *اسم. [گفتاری]* دایرە و دمەک؛ دەف و دایرە؛ سازگەلی مووسیقا، بەتایبەت سازی زەربی ‹یک دسته توی خیابان راه افتاده بودند و داریه‌ـدنبک می‌زدند: دەستەیەک کەوتبوونە نێو شەقامەوە و دایرە و دمەکیان لێ‌دەدا›.

**داس** / dās ، ـها/: *اسم.* ۱. دارە؛ داس؛ داسک؛ داریَ؛ شالوک؛ کەلەندۆ؛ داساچلۆ؛ جاخسووک؛ داسی دروێنە؛ ئامێرێ بە دەمەی تیژ و خوار و دەستەیەکەوە بۆ دروێنەی گژ و گیا ۲. تیزە؛ بڕە؛ تێغەی ماشینی دروگەر ۳. [انگلیسی] *اسم.* داس؛ لە زمانگەلی بەرنامەنووسی کەمپیوتەر.

**داستان** / dāstān ، ـها/: *اسم.* داستان؛ داسانە: ۱. *[قدیمی]* سەرگوروشتە؛ سەربهورد؛ بەسەرهات؛ مەرسەلا؛ مەرسەدە؛ ڕازی؛ ڕاز؛ دەنگ و باسی ڕابردوو ‹داستان زندگی‌اش را برایشان تعریف کرد: داستانی ژیانی بۆیان گێڕاوە› ۲. *[ادبی]* نەزیلە؛ کورتە چیرۆک؛ ڕاز؛ گەپ ۳. چیرۆک؛ چیرچیرۆک؛ چیرۆکە؛ حەقایەت؛ حەکایەت؛ چیرۆکی مندالان ٤. دیرۆک؛ چیرۆکی خەیاڵی ‹این داستان نیست و واقعیت دارد: ئەمە داستان نیە، ڕاستە› ٥. باسی سەرەکی ڕووداو، فیلم، شانۆ یان کتێبێک ‹داستان فیلم بسیار تأثرآور است: داستانی فیلمەکە زۆر دڵتەزێنە›.

▣ **داستان اخلاقی:** چیرۆکی ئاکاری؛ داستانێ کە لە سەر بایەخگەلی ئاکاری و گرنگیدان بە جێبەجێ‌کردنیان داکۆکی دەکا.

**داستان پلیسی:** چیرۆکی پۆلیسی؛ داستانی پۆلیسی؛ چیرۆکێ کە سەبارەت بە کوشتن و جەنایەت و تێکۆشانی پۆلیس بۆ دۆزینەوە و قوڵبەستکردنی جەنایەتکارانە.

**داستان تاریخی:** چیرۆکی مێژوویی؛ داستانی مێژوویی؛ بەسەرهاتێ کە بە پێی ڕووداو و لەمەڕ ژیانی کەسایەتیە مێژووییەکانەوە نووسراوە.

**داستان تربیتی:** چیرۆکی پەروەردەیی؛ چیرۆکی ڕاهێنەری؛ چیرۆکێ کە ئامانجی دڵگەرمکردنی خوێنەر بۆ بە دوادا چوونی نموونەگەلی هەڵکەوتە و بەرز و ڕێزگرتنی بایەخگەلی کۆمەلایەتیە.

**داستان جاسوسی:** چیرۆکی شۆڤاری؛ داستانی سیخوڕی؛ چیرۆکێ کە سەبارەت بە کاری سیخوڕی نووسراوە. هەروەها: **داستان جنایی؛ داستان عشقی؛ داستان فکاهی**

**داستان کوتاه:** نەزیلە؛ نەزیرە؛ کورتە چیرۆک؛ خدۆک؛ تمتیل؛ چیرۆکێ کە لە ۵۰۰۰ وشە زۆرتر نیە.

**داستان کودکان:** داسانە؛ حەقایەت؛ چیرۆکی مندالان؛ داستانی مندالان؛ چیرۆکێ کە بۆ مندالان نووسراوە.

**داستان واقعی:** چیرۆکی ڕاستەقانێ؛ بەسەرهات؛ ڕووداو؛ بەسەرهاتی کەسان یان ڕووداوای ڕاستەقانی.

**داستانپرداز** / dāstānpardāz ، ـها؛ ـان/: *اسم.*

چیرۆکـــەوان؛ چیرۆکـــوان؛ چیرۆکـــڤان؛ چیرۆکنووس؛ کەسێ کە داستان دەهۆنێتەوە یان دەنووسێ.

**داستانپردازی** / dāstānpardāzî ، ـها/: *اسم.* چیرۆکوانی؛ چیرۆکڤانی؛ چیرۆکنووسی؛ کار یان ڕەوتی هۆنینەوە یان نووسینی چیرۆک.

**داستانسرایی** / dāstānsarāyî ، ـها/: *اسم.* ۱. چیرۆکەوانی؛ چیرۆکڤانی؛ چیرۆکنووسی؛ کار یان ڕەوتی نووسین یان هۆنینەوەی چیرۆک ۲. چیرۆکبێژی؛ کار یان ڕەوتی گوتنەوەی چیرۆک ‹دربارەی جوانی خود داستانسرایی می‌کرد: سەبارەت بە سەردەمی لاوەتی خۆی چیروکبێژی دەکرد›. هەروەها: **داستانسرا**

**داستانگو** / dāstāngû ، ـها؛ ـیان/: *اسم.* چیرۆکبێژ؛ ڕازبێژ؛ کەسێ کە بۆ کەسانی دیکە داستان دەگێڕێتەوە.

**داستانگویی** / dāstāngûyî ، ـها/: *اسم.* چیرۆکبێژی؛ ڕازبێژی؛ کار یان ڕەوتی چیرۆک گوتنەوە؛ ڕازەوەگێلنەی.

**داستان‌نویس** / dāstānnevîs ، ـها؛ ـان/: *اسم.* داستان‌نووس؛ چیرۆکڤان؛ کەسێ کە داستان دەنووسێ. هەروەها: **داستان‌نویسی**

**داستانی** / dāstānî/: *صفت.* داستانی؛ چیرۆکی؛ بە بار یان چۆنیەتی داستانەوە ‹فیلم داستانی: فیلمی داستانی›.

**داسه** / dāse/: *اسم.* سۆ؛ داسە؛ داسوو؛ داسوولکە؛ داسووک؛ داسووکە؛ بژانگ؛ قەلاس؛ پرزەی گوڵە گەنم و جۆ.

**داش** / dāš ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* ۱. [از ترکی] *[مخفف]* کا؛ ئا؛ ئابرا؛ کاکە؛ کاکەبرا؛ ئاغەبرا ۲. [از ترکی] ئابا؛ لاتی بە ماریفەت: **داش‌مَشتی؛ داش‌مَشدی** ۳. *[قدیمی]* گڵ؛ داش؛ کوورە؛ کویرهە؛ جێگەی سواڵەت تێدا سوورکردنەوە.

**داشبرد** / dāšbord ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* داشبۆرد؛ سەفحەی خوار شووشەی بەرەوی ماشێنی وەتاغدار کە چرا و کلیل و پێژمێرگەلی پێوەندیدار بە کاری موتوری تێدایە.

**داشت**[1] / dāšt/: *اسم.* ۱. *[کشاورزی]* داشت؛ قۆناغێک لە نێوان چاندن و هەڵگرتنی بەرهەمدا کە کردوکۆشی وەک ئاودێران، سەمپاشی، بژار کردن و کوود دان لەو قۆناغەدا جێبەجێ دەبن ‹داشت محصول: داشتی داهات› ۲. *[کنایی]* هەبوو؛ دارایی ‹داشت و نداشت: هەبوو و نەبوو›.

**ـ داشت**[2]: *پیواژه.* ۱. ــ نان؛ ـگری؛ هەبوون و ڕاگرتن ‹گرامیداشت: ڕێزنان› ۲. ــ داشت ‹یادداشت؛ بهداشت: یادداشت؛ بێداشت› ۳. ـ ڕوانی؛ ــ داری؛ ـ یاری؛ ـ نۆڕی؛ ـ نواڕی؛ ـ نێری ‹چشمداشت: چاوەڕوانی›.

**داشتن** / dāštan/: *مصدر. لازم. متعدی.* // **داشتی:** هەتبوو؛ **داری:** هەتە؛ **بدار:** بتبێ// □ *لازم.* ۱. بوون؛ هەبوون؛ بیەی؛ خاوەن شتێ بوون ‹خانه داشتن؛ پول داشتن: خاوەن خانوو بوون؛ بە پارە بوون› ۲. هەبوون؛ بوون؛ بیەی؛ لە شتێ بەهرەمەند بوون ‹ذوق داشتن؛ جرئت داشتن: چێژ هەبوون؛ بە زات بوون› ۳. شیاو هەبوون؛ لەبار بوون؛ بیەی؛ ‹خوردن داشتن: شیاوی خواردن بوون› ٤. هەبوون؛ بوون؛ بیەی؛ پەیڕەوی کردن لە بڕیار یان بەرنامەیەک ‹با هم شوخی داریم: پێکەوە شۆخیمان هەیە› ٥. *[گفتاری]* خەریک بوون؛ پەرژان؛ نیشانەی درێژەدار بوونی کار ‹داشت می‌آمد؛ دارد می‌نوشد: خەریک بوو دەهات؛ خەریکە دەخواتەوە› □ *متعدی.* ٦. هەبوون؛ بوون؛ بیەی؛ خاوەنی پێوەندییێکی دیاریکراو بوون یان لە هەمبەریدا بوون ‹دوست داشتن؛ رفت و آمد داشتن: خۆش گەرەک بوون؛ هات و چوو هەبوون› ۷. ئاگادار بوون ‹هوای کسی را داشتن: ئاگاداری کەسێ بوون› ۸. کردن؛ کاری هاوکرد ‹تقدیم داشتن: پێشکەش کردن›. هەروەها: **داشتنی**

■ صفت فاعلی: **دارنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **داشته** (هەبوو)/ مصدر منفی: **نَداشتن** (نەهەبوون)

داش‌مشتی / dāšmaštî/: [از ترکی/ از عربی] ☜ داش ـ۲

داش‌مـــشدی / dāšmašdî/: [از ترکـی/ از عربـی] ☜ داش ـ۲

داعی / dā'î/: [عربـی]/اسم./ادبی/ ۱. گازه‌کـەر؛ نزاواچ؛ نزاخوێن؛ نزاکار؛ دۆعاکەر ۲. ـان؛ دُعات/ بانــگ‌ڕایــەڵ؛ بانگێــشتن‌کــەر؛ دەعوەتکــەر؛ دەنگ‌کەر ۳. هۆ؛ سۆنگە.

داعیــه / dā'îye، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. خـــوازە: ۱. کەڵکەڵە؛ خولیا؛ ویست؛ خواست یان ئـاواتی گەیشتن بە پلە و پایەیێکی تایبـەتی ‹مـدتی بـود داعیـه‌ی ریاسـت در سـر مـی‌پرورانـد: ماوەیـەک بـوو کەڵکەڵـــەی ســـەرۆکایەتی لـــە ســـەر دابـــوو› ۲. خوازیاری و لـە خـۆڕا دیتـوویی بـۆ مـافێکی شیاو ‹او در زمـان خـود داعیـه‌ی سـلطنت داشـت: لـە سەردەمی خۆیدا خوازەی پاتشایەتی هەبوو›.

داغ [۱] / dāq/:/اســم. داخ: ۱. /ـــهـــا/ داغ؛ داق؛ شوێنی چزان لەسـەر پێـست بـەهۆی شـتێکی داخـــەوە ‹داغ گذاشــتن: داخ کـــردن› ۲. درۆشـــم؛ کـــەوی؛ ســـۆیەر؛ ئـــامرازێکی کـــانزایی بـــە نەخشێکەوە کە (زۆرتـر) بـۆ داخ کـردن دەشـێ ۳./مجازی/ ئاسەواری ڕووداوێکـی زۆر دڵـتەزێن ‹داغ مرگ فرزند؛ داغ دل: داخی مەرگی منداڵ؛ داخی دڵ›.

▣ داغ دل:/مجازی/ داخی دڵ؛ نیشانەی خەمێ کە لە یاددا ماوەتەوە.

▣ داغ چیزی به دل کسی ماندن:/مجازی/ داخی شتێ بە سەر دڵی/ بە جەرگی کەسێکەوە مان ‹حکومت برگشت و داغ وزیـر شـدن بـه دلـش مانـد: دەسەڵات ڕووخا و داخـی بوونـە وەزیـر بـە سـەر دڵیەوە ما›.

داغ چیزی را به دل کسی گذاشـتن:/مجـازی/ داخی شتێ بۆ کەسێ جێ هێـشتن؛ جـەرگ کەسـێک بـە گوچکـا دان؛ داخـی شـتێ بـە جەرگی کەسێکەوە نان ‹انقلاب، داغ وزیـر شـدن را به دلش گذاشت: ڕاپەڕین، داخی وەزیر بوونی بـۆ جی هێشت›.

داغ دیدن:/مجازی/ داخ دیتن؛ داخ چەشـتن؛ تووشـــیاری کـــوڵ و کەســـەری ســـەخت و نەبڕانەوە بوون.

داغ زدن: کەواندن؛ کەلمۆشک لێدان؛ درۆشم لێـدان؛ داخ کـردن؛ نیـشانە دانـان لـە سـەر پێستەوە (بەتایبەت بۆ ماڵات).

داغ کردن: ۱. داخ‌کردن؛ داغ‌کردن؛ کەواندن؛ ئارهاندن؛ داغ پێوەنان؛ بە کانزا یـان شـتێکی سوورەوە بوو لەسەر لـەش شـوێن دانـان ‹بـا سیگار چند جای بدنش را داغ کرده بودند: بە جگـەرە چەند شوێنی لەشـیان داخ کردبـوو› ۲./گفتاری/ تەواو/ زۆر گەرم بوون؛ گەرمەوەزە بوون ‹امروز حسابی داغ کرده است: ئەمڕۆ تەواو گەرمی کردووە› ۳./مجازی، گفتاری/ تووڕە بوون ‹پاک داغ کردیم: تەواو تووڕە بووین›.

داغ کسی را تازه کردن:/مجازی/ داخ/ بـرینی کەسێک کولاندنەوە؛ داخی کەسـێک زینـدوو کردنـەوە؛ تازەکردنـەوەی خـەمی کەسـێک؛ بەستەو زاموو یۆی لابەردەی ‹با این کار داغ دلم را تازه کردی: بـەم کـارە زامەکـەمت کولانـدەوە›. هەروەها: **داغ دل کسی تازه شدن**

داغ [۲]: صفت./گفتـاری/ داخ؛ بەتین؛ تـووز؛ سـوور؛ سوویر؛ قوم ‹آب داغ: ئـاوی داخ›. هـەروەها: **داغ بودن؛ داغ شدن؛ داغ کردن**

داغـــان / dāqān/: [از ترکـــی] صـــفت./گفتـــاری/ ۱. تێک‌وپێک؛ ورد و خان؛ ورد و خاش؛ داغـان؛ بژالە؛ ورد و پەرژ و بلاوەبوو بە هـۆی داکـەوتن، لێکەوتن یان شکانەوە ‹زدی ماشین را داغان کردی: مالیتە ماشینەکەدا ورد و خانت‌کرد› ۲. بـەرباد؛ پەلاتە؛ کەل‌ـوەل؛ لێک‌پساو؛ لێـک هەڵپساو؛ بێ‌سەرە و بـەرە؛ تـەرت و توونـا؛ تـەفر و توونـا ‹خـانوادەمـان داغـان شـد و هـرکس بـه جـایی رفت: بنەماڵەمان تەرت و توونا بوون و هەر یەکە بۆ لایەک

چوو› ٣. *[مجازی]* شێواو؛ پەشێو؛ شپرز؛ ئالۆز؛ پەشۆکاو؛ پەشۆکیاگ؛ پەرۆش ‹دیروز که دیدمش پاک داغان بود: دوێنێ که دیتم تەواو شێوا بوو›.
هەروەها: **داغان بودن؛ داغان شدن؛ داغان کردن**

**داغبرگ** / dāqbarg ، ـها/: *اسم.* شوێنەگەلا؛ شوێنێک لەسەر لاسکەوە کە جێی گەلایەکی داوەریوە.

**داغدار** / dāqdār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* ئازیەتبار؛ داخدار؛ بەداخ؛ زۆر خەمین بە هۆی لە دەسدانی کەسێ یان شتێکی خۆشەویستەوە ‹بیچاره زن هنوز داغدار پسرش بود که شوهرش هم مرد: ژنی داماو هێشتا ئازیەتباری کوڕەکەی بوو، شووەکەشی مرد›.

**داغداغان** / dāqdāqān/: *اسم.* تاوەک؛ تاوک؛ تاوگ؛ تایلە؛ تایلێ؛ تاووت؛ تاوی؛ تەیلە؛ تیرەیەک درەختی گەورەی ناوچەی مەدیترانە و باکووری ئێران، بە گەلای هێلکەیی، نووکتیژ و ددانەدار، گوڵی تاقی درێژ و بەری گۆشتن و میوەی وشکی خڕی ڕەش یان قاوەیی خۆراکیەوە: **دغدغان؛ تاقوت**

**داغدیده** / dāqdîde ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* داخدار؛ ماتەمبار؛ داغدیە؛ تووشی کوڵ و کەسەرێکی زۆر بە هۆی مردنی خۆشەویستێکەوە ‹این فاجعه را به مادر داغدیده‌اش تسلیت می‌گوییم: بە بۆنەی ئەم کارەساتەوە، بە دایکی داخداری سەرەخۆشی ئێژین›.

**داغمه** / dāqme ، ـها/: [فارسی/ ترکی] *اسم.* پەترۆک؛ پترۆک؛ پترۆ؛ پەترۆ؛ بەشێ لە پێست کە بە هۆی برین، تاوانگازی یان شتی ترەوە، ڕەق و ڕەش یان قاوەیی دەبێتەوە و بڕێ جار دەقەڵشێ. هەروەها: **داغمه بستن**

**داغ و درفش** / dāq-o-derafš, -darafš/: *اسم.* *[مجازی]* داخ و درەوش؛ کۆ و کونجۆڵ؛ ئەشکەنجەی سەخت ‹مگر ما دختر شما را داغ و درفش کردیم؟: مەگەر کچەکەتانمان داخ و درەوش کردووە؟›.

**داغی** / dāqî/: *اسم.* *[گفتاری]* داخی؛ قومی؛ سووری؛ دۆخ یان چۆنیەتی داخ بوون ‹داغی کتری دستم را سوزاند: داخی کتریەکە دەستی سووتاندم›.

**دال** / dāl/: *اسم.* ١. دال؛ ناوی عەرەبی دەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی ٢. /ـها/ [کردی] *[قدیمی]* داڵ؛ دالاش؛ داراش؛ لاشخۆر؛ داڵەکەرخۆرە؛ داڵەگورگە؛ لاشەوەر؛ خەرتەڵ؛ لاشخۆرە؛ شانەکووڕە؛ مردارخۆر؛ باڵندەیەک بە میترێک باڵاوە کە مەودای نێوان باڵەکانی بە ٢,٥ میتر دەگا و سەر و ملی کەم تووکەوە و چەند جۆریان هەیە.

**دال** / dāl(l)/: [عربی] *صفت.* نیشانە؛ نیشان؛ نیشاندەر؛ پیشاندەر؛ شاندەر ‹این سخنان دال بر رنجش اوست: ئەم وتانە نیشانەی ڕەنجیانیەتی›.

**دالامبودولومب** / dālāmb-o-dulump/: *اسم.* *[تعریض]* دیمبڵێدیمباو؛ دیمبەلەدیمباو؛ دەنگی ژەندنی چەند سازی مووسیقا: **دامبول- دیمبول**

▣ **دالامبودولومب راه انداختن:** دیمبڵێدیمباو کردن/ نانەوە؛ بەرنامەی مووسیقا ڕێخستن.

**دالان** / dālān ، ـها/: *اسم.* دالان؛ داڵوو: ١. دارەپیچان؛ سیپک؛ کەلەگی؛ ڕێگەی سەر داپۆشراو ٢. ڕاڕەو؛ بندەرگە؛ نێودەرکە؛ ناقدەر؛ نێڤکۆ؛ بوارگەی (زۆرتر) باریک لە نێوان دوو دەرکی ماڵدا.

▣ **دالان هوایی:** دالانی هەوایی؛ دالانی ئاسمانی؛ هەر یەکە لە شوێنگەلی هاتوچۆی فڕۆکە لە ئاسماندا.

**دالاندار** / dālāndār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* دالاندار؛ گاراژدار؛ کەسێ کە کاری خاوێنکردنەوە و ئاگاداری لە گاراژ و کاروانسەرایە.

**دالانداری** / dālāndārî/: *اسم.* گاراژداری؛ دالانداری: ١. پیشەی گاراژدار ٢. پارەیێ کە دالاندار لە کڕیار یان خاوەنی کالا و بار وەریدەگرێ.

**دالانه** / dālāne ، ـها/: اسم. تونێل؛ دالانە؛ قومەش؛ قوموش.

**دالبر** / dālbor ، ـها/: اسم. ١. کەوانەی کوور؛ چەماوەی کوور ٢. دالبڕ؛ بڕشتی کەوانەیی لە جلکدا.

**دالتونیسم** / dāltonîsm/: [فرانسوی] اسم. [پزشکی] ڕەنگ‌کوێری (لە ناوی «دالتون» زانای بەناوبانگەوە گیراوە کە ئەو نەخۆشیەی هەبووە).

**دالی** / dālî/: صوت. میاو؛ باو؛ پشی‌میاو؛ پشێ‌میاو؛ وشەیەکە بۆ پێکەناندنی منداڵ، کاتێ کە کەسێ خۆی شاردۆتەوە و خۆی پیشانی دەدا دەیلێ.

▣ دالی کردن: باو- باوکردن؛ پشی‌میاوکردن؛ پشێ‌میاوکردن؛ چەشنێ کایە لەگەڵ زارۆکانە کە ئەگەر خۆی بە منداڵەکە نیشان دەدا، دەیلێ.

**دام** / dām ، ـها/: اسم. ١. داو؛ داڤ؛ دامی؛ دام؛ تەڵە؛ تەلهە؛ بەرەڕەت؛ تەپکە؛ پاداو؛ سووتار؛ ئامێرێک بۆ گرتنی گیانەوەران ‹دام گذاشتن: داو نیانەوە› ٢. [کنایی] داو؛ هۆی گیر و گرفت ‹دانەای در دام؛ افتادن در دام اعتیاد: دانێک لە داودا؛ کەوتنە داوی ئیعتیادەوە› ٣. [کنایی] پیلان؛ دەسیسە؛ نەخشە ‹برایش دام گذاشته بودند: پیلانیان بۆ گێرابوو› ٤. ئاژەڵ؛ ئاژاڵ؛ پاتاڵ؛ وڵسات؛ وڵس؛ گاوگۆڵ؛ مەڕ و ماڵات؛ چارپێ؛ چوارپێ؛ زیندەماڵ؛ ماڵیات؛ دەوڵەت؛ ماڵات؛ سەواڵ؛ گەلە و گاوەل؛ گیانەوەری چوارپای کەوی و ئالفخۆر (وەکوو مانگا، مەڕ، بزن، ئەسپ، کەر و وشتر).

▣ دام گذاشتن/ نهادن: داو داخستن؛ داو نانەوە؛ تەڵە نانەوە؛ دامەوە نیەی: ١. تەڵە نیان؛ تەڵە داخستن؛ داوچەقاندن بۆ ڕاو ‹شکارچیان برای روباه دام گذاشته بودند: ڕاوچیەکان داویان بۆ ڕێوی داخستبوو› ٢. [کنایی] پیلان گێڕان؛ نەخشەکێشان؛ دەسیسە چنیەی.

**از دام جستن**: لە داو داخەڵسان؛ ژ داڤ ڤەرسان؛ لە داو ڕایی بوون: ١. لە داو دەرچوون؛ لە تەڵە دەرهاتن ٢. [کنایی] ڕزگار بوون؛ لە گیر و گرفتێک دەرباز بوون.

**به دام افتادن**: کەوتنە داوەوە؛ دیل بوون؛ بوونە تەڵەوە؛ ئەنەدامی کەوتەی.

**داماد** / dāmād ، ـها/: اسم. زاوا؛ زەما؛ زەوا؛ زاڤا؛ زاما: ١. تازەمێرد؛ چراخ؛ چراغ ‹پسرم را داماد کردم: کوڕەکەم کردە زاوا› ٢. یەزەن؛ شووی کچ یان خویشک ‹دامادمان در بازار کار می‌کند: زاواکەمان لە بازاڕدا کار دەکا›.

▣ **داماد سرخانه**: زاڤابەندی؛ زاوای سەرماڵ؛ پیاوێ کە لە ماڵی خەزووریدا دەژی.

▣ **داماد شدن**: بوونە زاوا؛ ژن هێنان.

**داماد کردن** (کسی‌را): ژن بۆ هێنان؛ کەسێک کردنە زاوا ‹هر سه پسرش را داماد کرد و بعد مرد: بۆ هەر سێ کوڕەکەی ژنی هێنا پاشان مرد›.

**دامادی** / dāmādî/: اسم. زاوایی؛ زاوایەتی؛ زاڤایی؛ زەمایێ؛ زامایێ؛ دۆخ یان چۆنیەتی زاوا بوون ‹آمده‌ایم تقاضا کنیم پسرمان را به دامادی خودتان قبول کنید: هاتووین داوا بکەین کوڕەکەمان بە زاوایی خۆتان قەبووڵ کەن›.

**دامان** / dāmān/: اسم. [ادبی] داوێن؛ دەوان؛ دامنە ‹در روزهای تعطیل جمعی به دامان طبیعت پناه می‌برند: لە ڕۆژانی پشوودانداا چینێک دەچنە داوێنی سروشتەوە›.

**دامبول ـ دیمبول** / dāmbûldimbûl/ ☜ **دالامب و دولومب**

**دامپر** / dāmper/: [انگلیسی] اسم. دەمپەر؛ جۆرێک ماشینی هەڵکۆڵەر کە دیوی شۆفیر لە دواوە و هۆدەی بارەکەی لە بەرەوەیە و بەرد و خاک و خۆڵ هەڵدەکەنێ و بەرزیان دەکاتەوە: **دەمپر**

**دامپرور** / dāmparvar ، ـها؛ ـان/: اسم. ئاژەڵدار؛ دەوڵەتدار؛ کەسێ کە کاری ڕاگرتن و

بەخێوکردنی مالاتە.

**دامپــروری** / dāmparvarî/: /اسم. ئاژەلـداری: ۱. کار و ڕەوتی ڕاگـرتن و بـەخێوکردنی ئـاژەڵ ۲. /ـها/ دەولەتداری؛ مالاتداری.

**دامپزشــک** / dāmpezešk, -pezešg ، ـها؛ ـان/: /اسم. وەیتاڵ؛ بەیتاڵ؛ بژیشکی ئاژەڵ؛ کەسێ کـە کاری ناسینەوە و دەرمانی نەخۆشی ئاژەڵە.

**دامپزشــــکی** / dāmpezeškî, -pezešgî/: /اســم. وەیتالی؛ بەیتالی؛ زانست و توانـای ناسـینەوە و دەرمانی نەخۆشی ئاژەڵ.

**دامپینــــــگ** / dāmpîng/: [انگلیـــــسی]/اســم. بازاڕشکێنی؛ لە نەکاو هەرزان کردنەوەی کالا لە لایـەن فرۆشـیارێکەوە، بـۆ شـکاندنی ڕەقیبـان: دَمپینگ

**دامــدار** / dāmdār ، ـهـا؛ ـان/: /اسم. ئاژەلـدار؛ مالاتدار؛ دەولەتدار؛ پەزدار؛ کەسـێ کـە کـاری ڕاگرتن و دابەستنی ئاژەڵە.

**دامداری** / dāmdārî ، ـهـا/: /اسم. ئـاژەلـداری: ۱. دەولەتداری؛ مالاتداری ۲. شوێنی ڕاگـرتن و دابەستنی مالات.

**دامگـاه** / dāmgāh ، ـهـا/: /اسم. داوگـە؛ دامگـا؛ جێداو؛ جێتەلە؛ جێتەپکە؛ کختان؛ ئەو شوێنە بۆ ڕاو داوی لێ دەنێنەوە.

**دامن** / dāman ، ـها/: /اسم. داوێن؛ دامێن؛ داوان؛ دامان؛ دەوان؛ دەمـان؛ دامـەن؛ دامنـێ؛ دامـوو: ۱. ئاتەگ؛ ئەتەک؛ تەشک؛ پەلە؛ شاقەل؛ بەشی خواروو جل لـە کەلەکـەوە بـەرەوخوار ‹دامـن پالتو: داوێنـی پالتاو› ۲. سـەرکاب؛ ئـاوال کـراس؛ جلێ ژنانە لە کەلەکەوە بـەرەوخوار دەگـرێ ‹از این پارچه یک دامـن دوختم: لـەم پارچەیـە داوانـێکم دووری› ۳. پاڵداوێن؛ پالـدامێن؛ پالـداینە؛ ئـەو بەشە لە شتێ کە لە داوێندا جێی دەبێتەوە ‹یک دامن گل: داوێنـێ گوڵ› ٤. پالـداوێن؛ پالـدامێن؛ دەرەتان؛ پالداینە ‹دامن صحرا: داوێنـی دەشت›.

▣ **دامن برچیدن** ☜ **دامن کشیدن**

**دامن به کمر زدن**: /کنـایی/ قۆڵ لێ هەلمالین؛ چاک بە لادا کردن؛ خۆ بـۆ هـەل کـردن؛ لـێ وەخۆ کەوتن؛ خۆی لـێ هـەل کـردن؛ چـاک لێ‌هەلکردن؛ بەرکۆش هەلدان؛ بەرهەقی کار بوون ‹باید دامن همت به کمر بزنیم و حسابی کار کنیم: دەبێ قولی لێ هەلمالین و باش- باش کـار کەین›.

**دامن زدن**: /کنایی/ گەشاندنەوە؛ گەشەوکردن؛ بە دەمەوە دان؛ گـڕ پێـدان ‹تـو هـم بـە آتـش دشمنیـشان دامـن مـیزنـی: ئـەتۆش ئـاوری ناکۆکیەکەیان نەگەشینیەوە›.

**دامن کسی را آلودن**: /کنـایی/ کەسـێ بـەدناو کردن؛ ناوی کەسێک زڕاندن.

**دامــن کــسی را گــرفتن**: /کنـایی/ ۱. داوێـنـی کەسێ گرتن؛ کەسێ پێـوە بـوون؛ بـە ڕیـشی کەسـێکەوە بـوون؛ کەوتنـە بـەر تـاوان یـان گرفتێکەوە؛ کەسێک گرتنەوە ‹قتل پاسبان دامن او را هم گرفت: کوشتنی پاسەوان داوێنی ئەویشی گرت› ۲. دەس بـە داوێـنی کەسـێک بـوون؛ دەستەو داوێنی کەسێک بوون؛ هانا بۆ کەسێ بردن.

**دامن کشیدن**: /کنایی/ دوور بوون؛ کەنارەگرتن؛ کشانەوە؛ وێ کێشتەیوە: **دامن برچیدن**

**دامن آلوده** / dāman'ālûde ، ـها/: صفت. /کنایی، ادبی/ ۱. دامێن تەڕ؛ دامێن پیس؛ شـوال چەپـەڵ ۲. بەدناو؛ ناوزڕاو.

**دامــن‌شـلواری** / dāmanšalvārî ، ـهـا/: /اسم. شالوارۆکە؛ جلێ ژنانە، بە شێوەی دەرپێی کورت و هەراو کە لە دوورەوە لە دامەن دەکا.

**دامن کشان** / dāmankešān/: قید. /مجازی/ بـە لەنجە و لار؛ بە لەنجە؛ بە لارە؛ بە بێ‌ئاوڕدانـەوە؛ بە ئاین و ئۆینەوە ‹او می‌رود دامن‌کشان: دەڕوا بـە لەنجەو لارەوە›.

**دامنگیــر** / dāmangîr/: صفت. داوێـنگیر؛ هـۆی گیر و گرفت یـان ناڕەحـەتی ‹چنـد سـال بیمـاری

دامنگیر او شد و پس از آن هم زنش مرد: چەن سالان نەخۆشین داوێنگیری بوو، پاشان خێزانەکەیشی تێداچوو›.

**دامنه** / dāmane ، ـها/:/اسم. داوێن؛ داوێنە؛ دامێنە؛ دامێن: ۱. ئاتەگ؛ پەلە؛ گۆرت؛ پاڵداوێن؛ پاڵدامێن؛ پێدەشت؛ بنەتار؛ وەرپاڵ؛ بەرپاڵ؛ بنار؛ پادەشت؛ کاس؛ کونتار؛ قونتار؛ بناری یاڵ و چیا ‹دامنەی کوه: داوێنی چیا› ۲. بڕ؛ ئەندازەی ڕەنگدانەوەی چۆنیەتی، کارکۆیی، ڕەوت یان دیاردە یان بەری لۆژەیەک (وەک هەلاجانی ئاوەنگ) کاتێ کە لە جێگەی ئاساییدا تا دوورترین شوێنی بزووتنیەوە هەڵەنگێرێ ‹دامنەی نوسان: داوێنەی لۆژە› ۳. گەڕ؛ هەند؛ مەیدانی ڕەنگدانەوەی شت یان شوێنەوایەک ‹دامنەی صدا؛ دامنەی فعالیت: گەڕی دەنگ؛ هەندی چالاکی›.

▣ **دامنەی ارتعاش:** /فیزیک/ داوێنەی زایەڵە؛ داوێنەی دەنگدانەوە.

**دامنەی تغییرات:** داوێنەی گۆڕان؛ داوێنەی گۆڕانکاری.

**دامنەدار** / dāmanedār/: صفت. بەرین؛ بەربڵاو؛ گەورە و بەرپان ‹برای موفقیت او تلاشهای دامنەداری صورت گرفت: بۆ سەرکەوتنی تێکۆشانێکی بەربڵاو کرا›.

**داموز** / dāmûz ، ـها؛ ان/:/اسم. بەفرەلۆ؛ بەفرماڵ؛ بەفرماڵک؛ شەپلتە؛ شاپاڵۆخ؛ شەپەلۆخ؛ شاپالۆغ؛ وەروەرە؛ وەربەرۆ؛ وەروەرۆ؛ وەروەماڵ؛ پاڕووی پانی بەفرماڵین.

**دامی** / dāmî/: صفت. ئاژەڵی؛ ماڵاتی؛ پێوەندیدار بە ئاژەڵەوە ‹بیماری دامی: نەخۆشی ئاژەڵی›.

**دان**[1] / dān ، ـها/:/اسم. /گفتاری/ دان؛ دانە؛ دانی: ۱. دەنک ‹دان کردن: دان کردن› ۲. خۆراک، بەتایبەت خۆراکی باڵندە ‹دان مرغ: دانی مریشک›.

▣ **دان کردن:** قەشارتن؛ دان‌کردن؛ دانارکردن؛ دان لە پێست جویّ‌کردنەوە.

**ـ دان**[2]: پسوند. ـ دان؛ ـ دین؛ ـ دێن؛ دەفر؛ جێگای شتێک ‹گلدان؛ نمکدان؛ کاهدان: گوڵدان؛ خوێدان؛ کادێن›.

**ـ دان**[3]: پیوازه. ـ زان؛ خاوەن زانست ‹شیمی‌دان: کیمیازان›.

**دانا** / dānā ، ـیان/: صفت. زانا؛ دانا؛ دوونا؛ بزان؛ حان: ۱. زۆرزان؛ خاوەن ئاوەز و ئەزموونی زۆر ‹پزشک دانا: بژیشکی زانا› ۲. خاوەن زانست و ئاگایی ‹مرد دانا: پیاوی زانا›.

**دانائی** / dānā'î/ ☜ **دانایی**

**دانایی** / dānāyî/:/اسم. زانایی؛ زاناهی؛ زانایێ؛ دانایی؛ ئاقڵی؛ ئاگاداری؛ بار یان چۆنیەتی زانا بوون ‹دانایی توانایی است: زانایی توانایییە›: **دانائی**

**دانتل** / dāntel/: [فرانسوی]/اسم. دامتەڵ؛ چەشنێ پارچەی تۆڕیە.

**دان‌دان** / dāndān/: صفت. دانار‌دانار؛ گورۆ‌گورۆ؛ بە ڕوویێ پڕ لە زۆپ یان دانەی زۆر و وەک یەکەوە.

**دانستن** / dānestan/: مصدر. متعدی. لازم. // **دانستی:** زانیت؛ **می‌دانی:** دەزانی؛ **بدان:** بزانە// زانین؛ زانسن؛ زانەی؛ زانای؛ زانایش؛ زانەیش؛ زانایەنە: ☐ متعدی. ۱. ئاگاداری هەبوون یان پەیداکردن ‹نام کسی را دانستن: نێوی کەسێک زانین› ۲. داوەری‌کردن ‹گناهکار دانستن: تاوانبار زانین› ☐ لازم. ۳. پێ‌زانین؛ تێگەیشتن؛ فام کرن ‹دانستم کە دروغ می‌گوید: زانیم درۆ دەکا›.

هەروەها: **دانستنی**

■ صفت فاعلی: **داننده** (زانەر)/ صفت مفعولی: **دانسته** (زانراو)/ مصدر منفی: **نَدانستن** (نەزانین)

**دانسته** / dāneste/: قید. دەسانقەست؛ دەسەنقەست؛ ئانقەست؛ دەسای‌قەس؛ ئەنقەس؛ دەسقەس؛ لەقەست؛ لەقەزی ‹تو دانسته این کار را کردی: تۆ دەسانقەس ئەم کارەت کرد›.

**دانسیمتر** / dānsîmetr ، ـها/: [؟/ فرانسوی]/اسم. قورسی‌پێو؛ پڕایی‌پێو؛ دانسی‌میتر.

**دانسینگ** /dānsîng/: [انگلیسی]/اسم. دانسینگ؛ سەماگە؛ تیاترۆخانە؛ ژووری تایبەتی هەڵپەڕکێ و سەما لە ڕستووران یان کابارەدا.

**دانش** / dāneš ، ـها/:اسم. زانست؛ زاناهی؛ تۆرە؛ هین؛ کۆمەڵە زانیاریگەلێ ڕێکخراو و تەکووز و شیاو بۆ لێکدانەوە ‹دانش پزشکی: زانستی پزیشکی›.

**دانش افزایی** /dānešafzāyî/:اسم. کار یان ڕەوتی زۆرکردنەوەی زانست.

**دانش آموز** / dānešāmûz ، ـها؛ ـان/:اسم. قوتابی؛ قوتاوی؛ قتاوی؛ خوێندەوار؛ خوێنەوار؛ خوەنەوار؛ کەسێکی لە قوتابخانەی سەرەتایی، ناوەندی و پاش ناوەندیدا دەخوێنێ ‹دو تا دختر دانش‌آموز دارم یکی دبستانی و دیگری دبیرستانی: دوو کچی قوتابیم هەیە یەکێکیان سەرەتایی و ئەوی کە پاش ناوەندیە›.

**دانش آموزی**[1] / dānešāmûzî/:اسم. خوێندەواری؛ کار یان ڕەوتی خوێندن؛ فێر بوونی زانست.

**دانش آموزی**[2]: صفت. قوتابیانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە قوتابییەوە ‹مسابقەی دانش‌آموزی: کێبەرکێی قوتابیانە›.

**دانش اندوزی** / dānešandûzî ، ـها/:اسم. کار یان ڕەوتی کۆکردنەوەی زانست. هەروەها: **دانش اندوز**

**دانشپایه** /dānešpāye/:اسم. پۆل؛ پلە؛ کلاس ‹دانش‌آموز دانشپایەی چهارم: قوتابی پۆلی چوارەم›.

**دانش پرور** / dānešparvar ، ـان/: صفت. زانست‌پەروەر؛ هۆگری پەرەدان بە زانست ‹از شخصیتهای فرهنگدوست و دانش‌پرور شهرمان دعوت می‌شود در تأسیس این کتابخانە شرکت کنند: لە کەسایەتیە فەرهەنگ‌دۆست و زانست‌پەروەرەکانی شارەکەمان بانگێشتن ئەکرێ لە دامەزرانی ئەم کتێبخانەیەدا بەشداری بکەن›. هەروەها: **دانش‌پروری**

**دانش پژوه** / dānešpajûh ، ـان/: صفت. زانستخواز؛ لێکۆڵەر؛ تۆژەر؛ هۆگری لێکۆڵینەوەی زانستی. هەروەها: **دانش‌پژوهی**

**دانشجو** / dānešcû ، ـها؛ ـیان/:اسم. خوێندکار؛ خۆندکار؛ ئەوانەی لە پلەی بالا لە زانستگادا دەخوێنن ‹دانشجوی دانشگاه کردستان: خوێندکاری زانستگای کوردستان›.

**دانشجویی** /dānešcûyî/: صفت. خوێندکاری؛ خۆندکاری؛ پێوەندیدار یان سەر بە خوێندکارانەوە ‹کارت دانشجویی: پسوولەی خوێندکاری›.

**دانش دوست** / dānešdûst ، ـان/: صفت. زانستواز؛ زانستیار؛ هۆگری زانست ‹شرفخان امیری دانش‌دوست و دانشمند بود: شەرەفخان میرێکی زانستواز و زانا بوو›. هەروەها: **دانش‌دوستی**

**دانشسرا** / dānešsarā ، ـها/:اسم. یانەی زانست؛ پەروەردەی مامۆستایان؛ دامەزراوەیەکی فێرکاری بۆ ڕاهێنانی سەیدا و مامۆستایانی قوتابخانە.

◘ **دانشسرای عالی**: یانەی زانستی بالا؛ پەروەردەی بالای مامۆستایان.

**دانشکده** / dāneškade ، ـها/:اسم. زانکۆ؛ بەشێک لە دامەزراوەیێکی بالای ڕاهێنان (بەتایبەت زانستگا) کە لقێ لە زانست، هونەر یان زانیاری (یەک یان چەن ڕشتە) تێدا دەخوێندرێ ‹دانشکدەی ادبیات؛ دانشکدەی هنر: زانکۆی ویژەوانی؛ زانکۆی هونەر›.

**دانشگاه** / dānešgāh ، ـها/:اسم. زانستگا؛ زانستگە؛ دامەزراوەیەکی فێرکاری بالا بریتی لە چەن زانکۆ بۆ فێرکردنی خوێندکار لە بوارگەلی جۆراوجۆردا.

**دانشگاهی** / dānešgāhî ، ـان/: صفت. زانستگایی؛

زانستگەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە زانستگاوە ‹کتاب دانشگاهی: کتێبی زانستگایی›.

**دانش‌گستر** / dānešgostar ، ـان/: *صفت.* بە توانا و تایبەتمەندی پەرەدان بە زانست. هەروەها: **دانش‌گستری**

**دانشمند**[1] / dānešmand ، ـها؛ ـان/: *اسم.* زانیار؛ زانا؛ هۆزان؛ هزرڤان؛ کەسێ کە لە بوارێکی زانستیدا خاوەن بیر و ڕا و زانیاری بنەڕەتی بێ ‹در این تحقیق چند دانشمند همکاری می‌کنند: لەم تۆژینەوەدا چەند زانیار هاوقۆڵی دەکەن›.

**دانشمند**[2]: *صفت.* زانا؛ زانستمەند؛ هۆزان؛ هزرڤان؛ ئلمیەر؛ زۆرزان ‹پزشک دانشمند: بژیشکی زانا›.

**دانشمندانه** / dānešmandāne/: *صفت.* زانایانە؛ زانستمەندانە؛ هۆزانانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە زانایییەوە ‹بیانات دانشمندانه: وتاری زانستمەندانە›.

**دانشمندی** / dānešmandî/: *اسم.* زانستمەندی؛ زانایەتی؛ زۆرزانی؛ زانایۆخی؛ دۆخ یان چۆنیەتی زانستمەند بوون ‹دانشمندی اینشتین مانع از آن نمی‌شد که شعر بگوید یان ویلن بزند: زانستمەندی ئەنشتەین بەری شیعر هۆنینەوە و ویۆلۆن ژەندنی لێ نەدەگرت›.

**دانشنامه** / dānešnāme ، ـها/: *اسم.* زانستنامە: ١. پسوولەی کۆتایی هێنانی خوێندن لە زانستگایەک ‹دانشنامەی پزشکی خود را از دانشگاه علوم پزشکی کردستان دریافت کرد: زانستنامەی بژیشکیەکەی لە زانستگای زانستە بژیشکیەکانی کوردستان وەرگرت› ٢. فەرهەنگی بەرفراوان.

**دانشور**[1] / dānešvar ، ـها/: *اسم.* زانا؛ دانا؛ زانستوەر؛ کەسێ کە چالاکیەکی زانستی هەیە.

**دانشور**[2]: *صفت.* زانا؛ دانا؛ زانستوەر؛ بە زانست؛ خاوەن خوێندەواری یان ئاگاداری زانستی.

**دانشیار** / dānešyār ، ـان/: *اسم.* زانستیار؛ کەسێ کە پلەوپایەی زانستیاری هەبێ ‹دانشیار دانشکدەی ادبیات: زانستیاری زانکۆی وێژەوانی›.

**دانشیاری** / dānešyārî/: *اسم.* زانستیاری؛ پلەیەکی ڕاهێنەری لە دامەزراوەیەکی خوێندنی بالا لە نێوان سەیدایی و سەیدایاریدا.

**دانگ** / dāng/: *اسم.* دانگ؛ دانگە: ١. /ـها/ دۆنگ؛ شەش یەکی هەر شتێک ٢. *[موسیقی]* نیوەی گامێک.

**دانگی**[1] / dāngî/: *صفت.* دانگانە؛ خاوەن بەشی بەرانبەر لە خەرجدا ‹ناهار دانگی: فراوینی دانگانە›: **دۆنگی** *[گفتاری]*

**دانگی**[2]: *قید.* دانگی؛ دانگ بە دانگ؛ بە شێوەی بەشی وەک یەک ‹پول ناهار را دانگی حساب کردیم: پارەی فراوینەکەمان دانگی حەساب کرد›.

**دانده** / dānande ، ـها؛ ـگان/: *صفت.[گفتاری]* زانا؛ دانا؛ زانیار؛ ئاگا؛ هاگا ‹بهلول داننده: بوهلوولی زانا›.

**دانه** / dāne ، ـها/: *اسم.* ١. دان؛ تۆمی هەر گیایەک کە زۆرتر لە ناو کالانێکدایە و ماکی خواردنی پێویستی لەگەڵە ٢. دانە؛ دان؛ دنە؛ دەنک؛ میوەی دانەوێڵە ‹دانەی گندم؛ دانەی برنج: دانی گەنم؛ دانەی برینج› ٣. تۆم؛ دەنک؛ دان؛ دانەی ورد ـ ورد لە نێو هەندێ میوەی ئاودارا ‹انجیر بی‌دانه: هەنجیری بێ‌تۆم› ٤. گلار؛ گلۆر؛ دەنکە؛ دەنک؛ هەب؛ هەڤ؛ بۆڵ؛ دانێ؛ گلە؛ هەر شتێکی چکۆلە و خڕۆکە ‹دانەی انگور؛ دانەی تسبیح: گلاری ترێ؛ دەنکی تەزبێح› ٥. *[گفتاری]* دانە؛ دانێ؛ ژمارە؛ دەنک؛ گل؛ گلە؛ یەکەی ژماردن ‹پنج دانه مداد: پێنج دانە میداد› ٦. دان؛ دانە؛ دانێ؛ خۆراکی پەلەوەر ‹کبوتران دانه برمی‌چینند: کۆترەکان دان دەچننەوە› ٧. *[بافتنی]* دانە؛ هەر لۆیەکی بەن (کاموا) کە بە دەوری میل (یا قولاپ)دا پێکدێت.

▣ **دانەی آب‌پز:** دانێ؛ دانوو؛ دەنکە کولاو؛ دانەکولاو؛ دانووی دانەوێڵە؛ دانوولە؛ دانیک؛ دانەوێڵەی لە ئاودا کولاو.

**دانه‌ی انگور:** بۆڵ؛ بۆڵی؛ گـلار؛ گلـۆ؛ گـوللی؛ دەنکی ترێ.
**دانه‌ی برف:** کولیچ؛ کولی؛ پشک؛ کلوو؛ کلۆی بەفر.
**دانه‌ی بلغور:** بڕوێش؛ بڕێش؛ دەنکـی دەغلـی پەڕش.
**دانه‌ی بوداده:** دامشته؛ گەرمـشته؛ مرێـشکه؛ برێشکه؛ بریشکه بۆدراو؛ دانەوێـڵەی لـە سـەر سێڵ برژاو.
**دانه‌ی روغنی:** دەنکی ڕۆنی؛ دانێ کـە مـاکی ڕۆناوی زۆری هەیە و بۆ ڕۆن گرتن کەڵکی لێ وەردەگیرێ (وەک دەنکی گوڵەبەڕۆژە).
▣ **دانه کردن:** دانەکردن؛ جـوێ کردنـەوەی دان لە پێست.
**دانه‌ای** / dāne'î/: *قید.* ١. دانە‌ــدانـە؛ دانـەیی؛ بەدانەیی؛ بە دانەـ دانە ‹کم‌ـکم سیب و گلابی را هم دانه‌ای می‌فروشند: وردەـوردە سـێو و هـەرمێیش دانەـدانە دەفرۆشن› ٢. دانەیێک؛ دانـێ؛ دانێـک؛ دانێـی؛ دانێـو؛ دانێـوە؛ دانیـە؛ دەنـک؛ گلێـک؛ تەلێک؛ هـەر دەنـک ‹موزهـا دانـه‌ای ٢٠٠ تومـان: مۆزەکان دانەیێک ٢٠٠ تمەن›.
**دانه‌بندی** / dānebandî ، ـها/: *اسم.* دانەبەنـدی؛ چۆنیـــەتی چنـــینی دان لـــە چـــاو وردی و درشتیەوە.
**دانـه‌خـوار** / dānexār ، ـان/: *صفت.* دان‌خـۆر؛ دانــەخۆر؛ خــووگر بــە خــواردنی دان وەکــوو خواردەمەنی ‹مرغان دانه‌خور: مەلانی دان‌خور›.
**دانه‌ـدانـه**[1] / dānedāne/: *صفت.* دانارـــ دانـار؛ گورۆـگورۆ؛ بە ڕوویەکی پڕ لە زۆپ یان دەنکـی یەک چەشنەوە؛ .
**دانه ـ دانه**[2]: *قید.* دەنکەـ دەنکە؛ دەنکـ دەنـک؛ دانەـ دانە؛ دنەـ دنە؛ دانەــ دانـە؛ تـەڵــ تـەڵ؛ چڵـچڵ؛ تاکەـ تاکە؛ یەکیـ یـەکی؛ لبۆــ لبـۆ؛ لبـلب؛ گلووـگلوو؛ گلەــگلـە؛ هـەبــ هـەب؛ قلـقل؛ بە شـێوازێکی یـەک لـە دووی یـەک و جیاـجیـا ‹سیبها را دانه‌ـدانه پـاک مـی‌کـرد و در میوه‌خوری می‌چید: سێوەکانی دەنکەـ دەنکە خـاوێن دەکردەوە و لە سەرقاپەکەی دەچنی›.
**دانـــی**[1] / dānî/: [عربـــی] *صـــفت. [ادبـــی]* چەوتوچەوێڵ؛ چـەپوچێـڕ؛ چـەفت و نالـەبار؛ پەسـت؛ تـەرەس؛ خوێـڕی؛ دوونی؛ بـێئاکـار؛ نامەرد؛ بێ‌فەڕ؛ هۆڤەبەر.
**ـ دانی**[2]: *پسوند. [گفتاری]* ـ دان؛ ـ دانی؛ ـــ دانـە؛ جێگــەی ڕاگــرتن یــان جێگــەداری شــتێک ‹زباله‌دانی: زبڵ‌دان›.
**ـ دانی**[3]: *پیوازه.* ـ زانی؛ ـ دانی؛ زانـین ‹کـاردانی: کارزانی›.
**داو** / dāv/: *اسم.* ١. گە؛ سەرە؛ چەل؛ دەور؛ گەڕ؛ نۆرەی کایە ٢. بانک؛ ئەو پارەیـە کـە بـۆ بـرد و باخت دەخرێتە نێو گەمەوە.
**داودی** / dāvûdî ، ـها/: *اسم.* گوڵەداودی؛ گوڵـە داودی؛ گوڵــەداویتی؛ گوڵــە زووفــا؛ گوڵــەزۆفا؛ گیایێکی ڕازاوەیی یەک یان چەن ساڵەیە کە لە پاییزاندا دەڕوێ، گوڵـەکەی بـە چـەن ڕەنـگ و بیچمەوەیە و کەم‌پەڕ و زۆرپەڕی هەیە.
**داور** / dāvar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ١. دادوەر؛ دادڤـان؛ قازی؛ کەسێ کە لـە ناتـەبایی و نـاکۆکی نێـوان دوو یان چەنـد کەسـدا حـوکم دەکـا ٢. داوەر؛ کەسێ کـە لـە کێبـەرکێی وەرزشـیدا دادوەری دەکـا تـاکوو کایەکـەران لـە قـانوونی گەمەکـە لانـەدەن ‹یـک داور اتریـشی ایـن مـسابقه را داوری مـی‌کنـد: داوەرێکـی ئوتریـشی داوەری ئـەم کایـە دەکات›.
▣ **داور مَرضی‌الطرفین:** داوەری دوو لایەن ڕەزا؛ دادوەرێ کە دوو لایەنی کێشە پێ قایلن.
**داوری** / dāvarî ، ـهـا/: *اسم.* داوەری؛ دادوەری؛ دادڤانی: ١. کار یا ڕەوتی ڕاگەیشتن بە قـسەی دوو لایەنی شەڕ بـۆ ڕوون‌کردنـەوەی دروسـتی یان نادروستی خوازەکانیان ٢. پیشەی داوەر.
**داوطلب**[1] / dāvtalab ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی]

/اسم. داوخواز؛ خواستنی خۆیی؛ هەمەت؛ کەسێ کە بە خواستی خۆی ئامادەی ئەنجامی کارێ دەبێ ‹از داوطلبان خواسته می‌شود آرامش خود را حفظ کنند: لە داوخوازان داوا دەکرێت لەسەرخۆ بن›.

**داوطلب** ٢: *صفت.* داوخواز؛ خاوەن ویستی جێبەجێ‌کردنی کارێک ‹من هیچ وقت داوطلب کار نبودەام: من هەر داوخوازی کار نەوگم›.

**داوطلبانە** / dāvtalabāne /: [فارسی/ عربی/ فارسی] *قید.* داخوازانە؛ بە ویستی خۆ ‹داوطلبانە این کار را بە عهدە گرفت: داخوازانە ئەم کارەی وە ئەستۆ گرت›.

**داهی** / dāhî ، ـان؛ دُهات/: [عربی] *صفت.* [ادبی] وریا؛ هۆشیار؛ وشیار؛ زیرەک؛ زبت و زیرەک.

**داهیانە** ١ / dāhiyāne /: [عربی/ فارسی] *صفت.* هۆشیارانە؛ وشیارانە؛ زیرەکانە ‹سیاست هوشیارانە: سیاسەتی وشیارانە›.

**داهیانە** ٢: *قید.* وشیارانە؛ هۆشیارانە؛ بە شێوازی زیرەکانە ‹او داهیانە می‌کوشید مردم را علیه دشمن بسیج کند: هوشیارانە تێدەکۆشا خەڵک دژ بە دوژمن یەک‌دەنگ بکا›.

**دایر** / dāyer /: [عربی] *صفت.* باز؛ دامەزراو؛ کراوە؛ دانراو؛ بەرقەرار؛ ئامادەی کار یان کەڵک‌وەرگری ‹مغازەای دایر کرد؛ کتابخانەای دایر شدە است: دوکانێکی باز کرد؛ کتێبخانەیەک دانراوە›: **دائر**

▣ دایر بر: لەمەڕ؛ سەبارەت بە؛ لە بابەت؛ ژبابەت؛ پێوەندیدار بە ‹دستوری دایر بر افزایش حقوق معلمان صادر نشد: فەرمانێک لەمەڕ زۆرکردنی مووچەی مامۆستایانەوە دەرنەچوو›.

**دایرە** / dāyere ، ـها/: [عربی] *اسم.* ١. /دوایر/ جغز؛ جوغز؛ جەغز؛ چووز؛ خاز؛ گەر؛ گاخ؛ کۆز؛ بازنە؛ شووز؛ خیزک؛ گرۆڤەر؛ خرت ٢. دایرە؛ دایەرە؛ چەمبەرە؛ لە سازە زەربیەکانی ئێرانە لە بازنەیێکی چێوی کە پێستێ ناسکی لە سەر کێشراوە، پێک‌هاتووە و بە قامکی دەس لێدەدرێ ٣. /دوایر/ کارگێڕی؛ لقێ لە مەزرینگەیەک کە کارگەلێکی تایبەتی لە ئەستۆدایە ٤. *[مجازی]* دەوەر؛ دەڤەر؛ هێل؛ مەیدان؛ گۆڕەپان ‹دایرەی عمل: دەوەری کار› * **دائره**

▣ دایرەی زنگی ☜ **دایرەزنگی**

▣ دایرە زدن: دایەرە ژەندن؛ دایەرە لێدان.

**دایرەالبروج** / dāyeratolburûc, -borûc /: [عربی] *اسم.* بازنەی کەلوان؛ بازنەی برجگەل؛ وێنەی بازنەیەکە کراوە بە ١٢ بەشەوە، هەر بەشێک وێنەی کەلوویەکی تێدا کێشراوە، وەکوو کەلووی دووپشک، کارژۆلە و...: **فلک‌البروج؛ منطقه‌البروج**

**دایرەالمعارف** / dāyeratolma'āref ، ـها/: [عربی] *اسم.* زانستنامە؛ فەرهەنگی بەرفراوان؛ کتێب یان کتێبێ کە لەمەڕ بابەتگەلی گشتی، زانستی، وێژەیی، هونەری و...وە بە ڕیزی ئەلفوبێ یان لە ڕووی بابەتەوە، زانیاری دەدا.

**دایرەزنگی** / dāyerezangî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم. [موسیقی]* دایرەزەنگی؛ گەواڵ؛ دەفەی چووکی بە زریزە.

**دایگی** / dāyegî /: *اسم.* دایەنی؛ دایەتی؛ دایەیی؛ تایەنی؛ داینی؛ پیشە یان کاری دایەن ‹فاطمە خانم دایگی او را بر عهدە داشت: فاتمە خانم دایەنی ئەوی بە ئەستۆ بوو›.

**دایم** ١ / dāyem /: [عربی] *صفت.* هەمیشەیی؛ دایمی؛ دایمەیی؛ هەتاهەتایی ‹اقامت دایم: نیشتەجێی هەمیشەیی›: **دائم**

**دایم** ٢: *قید.* هەمیشە؛ بەردەوام؛ هەمیشە دەرەی؛ دایمە؛ هەر؛ دۆم؛ دایمە و دەرهەم؛ دایمەی خوا ‹دایم بهانە می‌گرفت و چیزی می‌خواست: هەمیشە بیانووی دەگرت و شتێکی دەویست›: **دائم**

**دایماً** / dāyeman /: [عربی] *قید.* هەمیشە؛ بەردەوام؛ هەمیشە دەرەی؛ دایمە؛ دۆم؛ دایمە و دەرهەم؛ دایمەی خوا ‹دایماً می‌ترسید: هەمیشە دەترسا›: **دائماً**

**دایم‌التزاید** / dāyemottazāyod/: [عربی] *صفت.* *[نامتداول]* هەر لە زۆری؛ هەمیشە لە زۆر بوون؛ دایمە لە زۆر بوون؛ بە تایبەتمەندی زۆر بوونەوەی هەمیشەییەوە.

**دایم‌الخمر** / dāyemolxamr ، ـها/: [عربی] *صفت.* دایمەمەست؛ هەمیشەمەس؛ دایم و دەرهەم خەریکی خواردنەوەی ئەلکول.

**دایمی** / dāyemî ، ـها/: [عربی] *صفت.* هەمیشەیی؛ دایمی؛ خاوەن بار و دۆخێکی هەمیشەیی ‹خانەی دایمی؛ سکونت دایمی: خانووی هەمیشەیی؛ نیشتەجێ دایمی›: **دائمی**

**داین** / dāyen/: [عربی] */اسم. [حقوق]* بستانکار؛ بستێنکار؛ وامدەر؛ خاوەن قەرز؛ کەسێ کە قەرز دەدا بە خوازیار: **دائن**

**دایناسور** / dāynāsor ، ـها؛ ـان/: [انگلیسی] */اسم.* دایناسۆر؛ خزۆکی زل‌تووزی دەورانی میزۆزوییک بە درێژایی یەک تا ۳۰ میترەوە کە لە بەژ و ئاودا ژیاوە و لە کۆتایی دەورانی کرتاسەوە لە ناو چووە: **دینوسور**

**دایه** / dāye ، ـها؛ ـگان/: */اسم.* دایە؛ دایەن؛ دادی؛ دایان؛ ئادی؛ تایان؛ تایەن؛ دادۆک؛ دایین؛ لەلەی ژن؛ ئەو ژنەی کە لە بەرانبەر وەرگرتنی مووچەیەکەوە بە منداڵی خەڵک شیر دەدا و ئاگاداری لێوە دەکا.

⊡ **دایه‌ی مهربانتر از مادر:** *[کنایی]* ئەسکوێی لە دیزە بەکوڵتر؛ کوچک لە ئاگر گەرمتر؛ لە چوارشەمە سوورتر؛ کەسێ کە بە درۆ و ناڕەوا دڵسۆزی و مێهرەبانی بۆ کەسێ دەکا.

**دایی** / dāyî ، ـها؛ ـان/: */اسم.* خاڵ؛ خاڵ؛ خاڵۆ؛ خالۆ؛ خالوو؛ خالە؛ ئالۆ؛ لالە؛ لالۆ؛ لاکوو؛ لالوو؛ هالوو؛ هالوا؛ کاکۆیە؛ کاکۆ؛ برای دایک: **دائی**

**دایی‌زاده** / dāyîzāde ، ـها؛ ـگان/: */اسم.* خاڵۆزا؛ خاڵۆزاگ؛ لالۆزا؛ هالۆزا؛ کوڕەخاڵ و کچە خاڵ؛ منداڵی خاڵ.

**دب‌اصغر** / dobbe'asqar/: [عربی] ☜ خرس کوچک، **خرس**

**دباغ** / dabbāq ، ـها؛ ـان/: [عربی] */اسم.* دەواخ؛ دەواغ؛ دەباخ؛ هەلال؛ هەلاڵچی؛ دەباخچی؛ بۆنگچی؛ چەرمچی؛ تێشوو؛ بۆنگ؛ چەرمگەر؛ کەسێ کە پیشەی پاک‌کردن و خۆشەکردنی پێستە.

**دباغخانه** / dabbāqxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی] */اسم.* دەباخ‌خانە؛ هەلاڵ‌خانە؛ دەواخانە؛ خۆشەخانە؛ خۆشخانە؛ گەمارگە؛ خۆشگە؛ ئەو شوێنە هەلاڵی تێدا خۆشە دەکرێ.

**دباغی** / dabbāqî/: [عربی] */اسم.* دەباخی؛ گەمار؛ خوەشە؛ کاری خۆشەکردنی چەرم بە دەرمان.

⊡ **دباغی کردن:** هەلاڵکردن؛ هەلاڵدان؛ ئالوون؛ پووین؛ دەباغ کردن؛ خۆشەکردنی چەرم بە دەرمان و جەفتەوە.

**دبّ اکبر** / dobbe'akbar/: [عربی] ☜ خرس بزرگ، **خرس**

**دبدبه** / dabdabe/: [عربی] */اسم.* سەنسەنە؛ تەنتەنە؛ سەنتەنە؛ هنگ‌وونگ؛ ئینجەوفینجە؛ دەبدەبە؛ تەمتەراق؛ تەشریفاتی و بە شان و شکۆ.

**دبر** / dobor/: [عربی] */اسم.* ۱. *[نامتداول]* پشت؛ پەشتی؛ سەر شان تا کەمەر، لە پشتەوە ۲. قوون؛ قنگ؛ قن؛ پیزی؛ تن؛ تنە؛ کۆم؛ فیچەنە.

**دبران** / dabarān/: [عربی] */اسم. [نجوم]* دەبران؛ بورجی‌گا؛ گەشترین ئەستێرەی کەلووی گا کە لە چای گا ناسراوە و کەوتۆتە پشتی ئەستێرەی کۆوە.

**دبستان** / dabestān ، ـها/: */اسم.* دەبستان؛ سەرەتایی؛ قوتابخانەی سەرەتایی؛ فێرگەی زارۆکان ‹آرام به دبستان می‌رود: ئارام دەڕواتە دەبستان›.

**دبستانی** / dabestānî ، ـها/: *صفت.* دەبستانی؛ سەرەتایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە پلەی

سەرەتاییەوە ‹کتابهای دبستانی؛ کودک دبستانی: کتێبگەلی دەبستانی؛ منداڵی سەرەتایی›.

**دبش** / debš، ـها/: *صفت.* تفت؛ بە چێژە یا بۆنی هێندێک تیژ و گەسەوە.

**دبق** / debq، ـها/: [عربی]/*اسم.* دەمووکانە؛ دەمکانە؛ دمکانە؛ دەنووکە؛ مووێزک؛ نحۆر؛ مووخۆر؛ پنچەدارێکە، سرێشێکی لینجی سەوزی هەیە، جاران بۆ نەرمکردنەوەی سنگ بەکار دەبرا، ئێستا دەدرێت لە دار و درەخت بۆ ئەوەی باڵندەی پێوە بنووسێت، بۆ ڕاوکردن.

**دبلنا** / dabelnā/: [روسی] ☜ **لوتو**

**دبنگ** / dabang، ـها/: *صفت.* دەبەنگ: ۱. گێل؛ گێلۆکە؛ گەلحۆ؛ حۆل؛ حەپۆل؛ شەواک؛ گێژ؛ بێهۆش ۲. لاژگ؛ لاژی؛ تەپەقورە؛ لەوس؛ خوێری؛ خۆری؛ بێکارە و بەکارنەهاتوو.

**دبنگوز** / dabangûz، ـها/: *صفت.[مستهجن]* ترتەمان؛ دەبەنگ؛ لەوس؛ لاژگ؛ لاژی؛ تەپلمۆس.

**دبور** / dabûr/: [عربی]/*اسم.* دەبوور؛ بای خۆرئاوا؛ بایەک کە لە خۆرئاواوە هەڵدەکا.

**دبوری** / dabûrî/: [عربی] *صفت.[گفتاری]* خوێری؛ خۆری؛ لاقەو؛ بێکارە؛ لەشگران؛ خوتوخوێری.

**دبوس** / dab(b)ûs، ـها/: [معرب از ؟]/*اسم.* *[قدیمی]* گورزی ئاسنی؛ کوتەکی ئاسنی؛ داردەستی ئاسنی.

**دبه** / dabbe/: [عربی]/*اسم.* دەبە: ۱. /ـها/ دەبە؛ دەبێ؛ دەفری سەردار و دەستەدار، زۆرتر لە پلاستیک، تراوی تێدا هەڵدەگرن ۲. تەشقەڵە؛ گەڕ؛ گزی؛ سەرپێچی لە گفت و پەیمان.

■ **دبه درآوردن/ کردن**: دەبە دەرهێنان؛ دەبە دان؛ قاپگرتن؛ لە ئەرکی سەرشان لادان ‹خریدار دبه درآورد و قالی را پس داد: کڕیارەکە دەبەی دەرهێنا و فەرشەکەی داوە›.

**دبه خایه** / dabbexāye/: [عربی/ فارسی] *صفت.* *[گفتاری]* قۆڕ؛ قێرە؛ گونشۆڕ؛ نەخۆشی گون پەنەمان.

**دبی** / debî/: [فرانسوی] ☜ **آبدهی**

**دبیب** / dabîb، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم.[قدیمی]* قوڕاویلکە؛ سارسارۆک؛ ئاوڕۆشنکەرەوە؛ ئاوڕۆشنکەرە؛ ئاوڕۆشنەوکەرە؛ ئاوروونکەرە؛ ئاوڕوونکە؛ مێروویێکی ڕەشی مەیلەو سووری چکۆلەیە بە سەر ئاوی لیخندا بە پەلە دێت و دەڕوا و ساف و زەلالی دەکاتەوە.

**دبیت** / dabît/:/*اسم.* ساتین؛ ساتان؛ ساتەن؛ چەشنێ پارچەی هەرزان لە لۆکەیە کە سافە و بۆ ئاستەڕ بەکار دێ.

**دبیر** / dabîr، ـها؛ ـان/:/*اسم.* دەبیر: ۱. مامۆستا؛ کەسێ کە لە پلەی پاشناوەندیدا وانە دەڵێتەوە ۲. مونشی؛ سکرتێر؛ بەڕێوەبەر؛ نووسیاری ڕێکخراوە، ئەنجوومەن، پارت یان لێژنە ‹دبیر انجمن ریاضی: بەڕێوەبەری ئەنجومەنی ڕیازی› ۳. بەرپرس؛ نووسەر؛ ڕازگر؛ دووهەمین پلەی باڵوێزخانەیەک ‹دبیر سفارت سویس: بەرپرسی باڵوێزخانەی سویس›.

■ **دبیر کل** ☜ **دبیرکل**

**دبیرخانه** / dabîrxāne، ـها/:/*اسم.* نووسینگە؛ دەبیرخانە: ۱. یازخانە؛ دەفتەرخانە؛ بەشێ لە ڕێکخراوە کە کاری نامە نووسین و وەرگرتن و هەناردنی نامە لەوێوە جێبەجێ دەبێ ‹نامەات را ببر دبیرخانە ثبت کنند: نامەکەت بەرە یازخانە تۆماری بکەن› ۲. ناوەندی کارگێڕی پارت، ئەنجومەن یان ڕێکخراوەیەک.

**دبیرستان** / dabîrestān، ـها/:/*اسم.* دواناوەندی؛ دەبیرستان؛ پاشناوەندی؛ دامەزراوەی فێرکاری پاش پلەی ناوەندی و پێش زانستگا.

**دبیرستانی** / dabîrestānî، ـها/: *صفت.* دواناوەندی؛ پاشناوەندی؛ دەبیرستانی؛ پێوەندیدار یان سەبارەت بە دەبیرستانەوە ‹کتابهای دبیرستانی: کتێبگەلی دواناوەندی›.

**دبیرکل** / dabîr(e)kol(l)، ـها/: [فارسی/ عربی] /اسم. سەرۆک؛ سەرۆکی ڕێکخراوە، ئەنجومەن یان حیزبێک ‹دبیرکل سازمان ملل متحد: سەرۆکی ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان›.

**دبیری** / dabîrî/: /اسم. دەبیری: ۱. کاری دەبیر ۲. یەک لە پلەگەلی فێرکاری.

**دپارتمان** / depārt(e)mān، ـها/: [فرانسوی] /اسم. دیپارتمان؛ بەش؛ پاژ (لە نەخۆشخانە)؛ گرۆ (لە زانستگا) بەشێک لە مەزرینگە کە کارێکی دیاریکراوی تێدا دەکرێ.

**دپو** / depo، ـها/: [فرانسوی] /اسم. ۱. هەمار؛ هومار ۲. کۆگە؛ کۆگا.

**دترمینیسم** / determinism/: [فرانسوی] /اسم. دیترمینیسم؛ خورتیوازی؛ جەبرییەت؛ ڕوانگەیەکی فەلسەفی پێڕێژکراو بەوەی کە دیاردەگەلی جیهان بە پێی هەلومەرجێک بەدی دێن کە هەڵکەوت ڕوودانیان مسۆگەر دەکا و ئەم خورتیە لە تەواوی سروشتدا بەدی دەکرێ.

**دتکتور** / detektor، ـها/: [فرانسوی از انگلیسی] /اسم. ئاشکراکەر؛ ئاشکراساز؛ خویاکەر؛ دەرخەر.

**دج** / dac/: صفت. دەژ؛ دەق؛ دەکارنەکراو؛ دەست لێنەدراو ‹صبح که رفتم، ظرف شیرینی دج بود: بەیانی کە چووم، قاپی شیرینیەکە دەژ بوو›.

**دجاجه** / dac(c)āce/: [عربی] ☜ **قو ـ۱**

**دجال** / daccāl/: [عربی] /اسم. *[فرهنگ مردم]* جاڵ؛ جرجاڵ؛ جەجاڵ؛ ججاڵ: ۱. کەرسوارێکی خەیاڵیە کە گوایە ڕۆژێک دەردەکەوێ و خەڵک بانگ دەکاتە سەر ئایینی خۆی ۲. *[کنایی]* درۆزن و گزیکار؛ ساختەچی.

**دچار** / dočār/: قید. تووش؛ تووشیار؛ گیرۆدە؛ دوچار؛ تووشبووگ؛ کولک؛ ئەوقە؛ ئاوقە؛ تلیاگ؛ لە هەمبەر دۆخ یان ڕووداوێکی خراپەوە ‹آرام دچار دردسر شده است: ئارام تووشی دەردیسەر بووە›.

**دخالت** / dexālat, daxālat، ـها/: [عربی] /اسم. بەشداری؛ کارپێوەیی؛ کاربەسەری؛ کار یان ڕەوتی دەست تێوەردان؛ دەست تێبردن؛ بەشدار بوون لە کارێکدا.

**دخانیات** / doxāniy(y)āt/: [عربی] /اسم. دوخانیات: ۱. ئەوەی لە تەماکۆ بەرهەم دێ و بۆ دووکەڵکردن بە کار دەڕوا (وەک جگەرە) ۲. دامەزراوەیێک کە پاوانکردنی کڕین، فرۆش، بەرهەم هێنان و... ئەو ماکانەی وەئەستۆیە.

**دخت** / doxt/: /اسم. *[ادبی]* کچ؛ کەنیشک؛ کیژ؛ کناچێ؛ دوێت؛ دۆت؛ منالی مێوینەی مرۆڤ.

**دختر** / doxtar، ـها؛ ـان/: /اسم. کچ؛ کەچ؛ کیژ؛ کەنیشک؛ کەینەک؛ کەینەکە؛ کناچێ؛ کەنی؛ کێنا؛ کنا؛ ویچان؛ دوت؛ دوەت؛ دت؛ تە؛ دتە؛ دوێت؛ دۆت؛ دوەر؛ دوێتە؛ قز؛ قیز: ۱. فرزەندی مێوینەی مرۆ ‹بچەشان دختر بود: منداڵەکەیان کچ بوو› ۲. کچ ئازەو؛ کەنیشکە عازەو؛ کلیلبەبەرۆک؛ خاما؛ مرۆڤی مێوینە کە هێشتا شووی نەکردووە.

▣ **دختر برادر** ☜ **دختربرادر**

**دختر تلفنی**: *[کنایی]* ژنێ بەدکارە کە مشتەریەکانی بە تەلەفوون بانگی دەکەن.

**دختر خواهر** ☜ **دخترخواهر**

**دختر دمِ بخت**: خاما؛ کچێ کە وەختی شوو کردنیە.

**دختر سعدی**: *[کنایی]* گەڕاڵ؛ ماڵانگەڕ؛ ماڵەوماڵکەر؛ یانەویانەکەرێ؛ کەسێ کە زۆر خوازیاری مێوانی چوون و گەڕانە و لە ماڵی خۆی گیر نابێ: **زن ملانصرالدین**

**دختر ناتنی**: زڕکچ؛ زڕکەچ؛ کچهەلی؛ نەڤس؛ کچی مێرد بۆ باوەژن یان کچی ژن بۆ زڕباب.

▣ **دختر دادن**: *[گفتاری]* کچ دان؛ کناچە دای؛ کچی خۆ بۆ هاوسەری بە کەسێک دان ‹ما به بیکار جماعت دختر نمی‌دهیم: ئێمە بە مرۆی بێکار کچ نادەین›.

**دختر گرفتن:** *[گفتاری]* کچ خواستن؛ دەستی کچ گرتن؛ کچێک بە هاوسەری هەڵبژاردن ‹این دختر را برای پسرت بگیر: ئەم کچە بۆ کوڕەکەت بخوازە›.

**دختراندر** / doxtarandar ، ـها/: *اسم.* زڕکچ؛ زڕکەچ؛ کچهەلی؛ نەڤس؛ کچی مێرد بۆ باوەژن یان کچی ژن بۆ زڕباوک.

**دخترانه** / doxtarāne ، ـها/: *صفت.* کچانە؛ کەچانی؛ کەنیشکانە؛ کناچانە؛ دوێتانە: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە کچانەوە ‹لباس دخترانه: جلوبەرگی کچانە› ۲. وەکوو کچان ‹قیافەی دخترانه: ڕواڵەتی کچانە›.

**دخترباز** / doxtarbāz/: *صفت.* پسکەباز؛ کچباز؛ بە خوو و هۆگریەتی کچبازیەوە.

**دختربازی** / doxtarbāzî/: *اسم.* پسکەبازی؛ کچبازی؛ ئەو کردەوەیە کە کوڕ یان پیاوێکی لاو بۆ پێوەندیگرتن لەگەڵ کچاندا دەیکا (وەکوو دۆزینەوە یان ژێر سەر نانی دۆستی کچ).

**دختربچه** / doxtarbačče ، ـها/: *اسم.* لەیرێ؛ کچۆڵە؛ کیژۆڵە؛ کچک؛ کەنیلە؛ کەچیلۆک؛ کناچلێ؛ کچێک بە تەمەنی نێوان ۲ تا ۱۲ ساڵانەوە.

**دختربرادر** / doxtarbarādar/: *اسم.* کچبرا؛ کچەبرا؛ کچی برای کەسێک ‹دختربرادرش عروس همسایەی ماست: کچبرای بووکی دراوسێکەی ئێمەیە›.

**دخترحاجی** / doxtarhācî ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم. [مجازی]* کچەشێخ؛ کچەئاغا؛ کچی کەسێکی زۆر دەوڵەمەند.

**دخترخاله** / doxtarxāle ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* کچەپوور؛ کەنیشک میمک؛ کناچۆ مەتێ؛ کچی پوور (خوشکی دایک).

**دخترخواندگی** / doxtarxāndegî/: *اسم.* دۆخ یان چۆنیەتی هەڵبژێردرانی کچ وەکوو فرزەند لە لایەن کەسێکەوە.

**دخترخوانده** / doxtarxānde ، ـها/: *اسم.* کچێ کە کەسێک وەک منداڵی خۆی هەڵیبژاردووە.

**دخترخواهر** / doxtarxāhar ، ـها/: *اسم.* کچەخوشک؛ وارکەنیا؛ کچی خویشک؛ خوشکەزای مێوینە.

**دختردایی** / doxtardāyî ، ـها/: *اسم.* کچەخاڵ؛ کەنیشکی خاڵۆی کەسێک.

**دخترزا** / doxtarzā ، ـها/: *صفت.* کچەزێ؛ بە تایبەتمەندی بە دنیا هێنانی کچ لە هەموو یان زۆرتری سک و زاکانیدا.

**دخترزاده** / doxtarzāde ، ـها/: *اسم.* کچەزا؛ کناچەزا؛ کەنیشکەزا؛ هەر کام لە منداڵانی کچی کەسێک ‹آزاد دخترزادەی دایی‌ام است: ئازاد کچەزای خاڵۆمە›.

**دخترعمو** / doxtaramû, -'amû ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* دوتمام؛ کچەمام؛ کچمام؛ کناچۆ مامۆی؛ کچی مامەی کەسێک.

**دخترعمه** / doxtar'amme, -'amme ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* کچەپوور؛ کچ میمک؛ کچەمەتێ.

**دخترمدرسه** / doxtarmadrese, -madrase ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* کچەقوتابی؛ کچێ کە دەچێتە قوتابخانە: **دخترمدرسه‌ای**

**دخترمدرسه‌ای**/ doxtarmadrese'î, -madrase'î/: [فارسی/ عربی] ☜ **دخترمدرسه**

**دختری**[1] / doxtarî/: *اسم.* ۱. کچێتی؛ کچیەتی؛ کەنیشکی؛ کچی؛ دوێتی؛ کناچەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کچ بوون ۲. *[مجازی]* بن؛ بنە؛ کچێنی؛ پەردەی کچیەتی.

**دختری**[2]: *صفت.* کچی؛ کەنیشکی؛ کناچەیی؛ دوێتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کچەوە ‹نوەی دختری: نەوەی کەنیشکی›.

**دخشه** / daxše ، ـها/: [؟] *اسم.* دروٚڤ؛ هەر کام لەو نیشانانە کە بۆ نووسین بە کار دەڕوا (وەک پیت، ژمارە و نیشانەگەلی خالبەندی).

**دخل** / daxl/: [عربی]/*اسم*. ۱. دەخڵدان؛ داخڵە؛ دەخیلە؛ دەخڵ؛ دەغەڵیە؛ دەغڵ؛ قوتووی جێی دراوی دوکاندار ‹پول را گرفت و گذاشت توی دخل: پارەکەی گرت و نایە نێو دەخڵدانەوە› ۲. /ـها/ دەخڵ؛ دەغڵ؛ پارەیەک کە لە نێو دەخڵەداندایە ‹همەی دخل من همین است: دەخڵەکەم هەمووی هەر ئەوندەیە› ۳. /ـها/[مجازی] داهات؛ دەرامەت؛ بارەچە ‹دخل روزانەاش چقدر است؟: داهاتی ڕۆژانەی چەندە؟› ٤. پێوەندی؛ پەیوەندی ‹این کار هیچ دخلی به ما ندارد: ئەم کارە هیچ پێوەندیەکی بە ئێمەوە نیە›.

▣ **دخل را زدن**: دەخڵ بڕین؛ پارەی نێو دوکان دزین ‹تا رفتم جنس بیاورم دخل را زد و رفت: تا ڕۆیشتم شتی بۆ بێنم دەخلی بری و دەرچوو›.

**دخل کردن**: داهات بوون ‹چقدر دخل کردی؟: چەندت داهات بوو؟›.

**دخل کسی را درآوردن**:[مجازی] لە پا خستنی کەسێک؛ کەسێک دەردی سەگ دان؛ کەسێک لە کار خستن ‹دخل آزاد را درآوردم: ئازادم لە پا خست›. هەروەها: **دخل کسی آمدن**

**به کسی دخل نداشتن**: کاری بە کەسێکەوە نەبوون ‹به تو دخلی ندارد: کاری بە تووە نیە›.

**دخل و خرج** / daxl-o-xarc/: [عربی]/*اسم*. دەخڵ و خەرج؛ داهات و داچوو؛ داهات و خەرج: **خرج و دخل**

▣ **دخل و خرج کردن**: داهات و داچووکردن؛ دەخڵوخەرجکردن؛ بەشکردن؛ وەسکەردەی ‹این مغازه که گرفتی دخلوخرج می‌کند؟: ئەم دوکانەی گرتووتە داهات و داچوو دەکا؟›.

**دخمسه** / daxmase/: [عربی] ☜ **دغمَسه**

**دخمه** / daxme ، ـها/: *اسم*. داخمە؛ دەخمە؛ دەغمە: ۱. *[مجازی]* بۆدڕ؛ کۆرەوڵە؛ جێگای تەنگ و تاریک ‹تو اسم این دخمه را گذاشتی اتاق؟: تۆ بەم داخمەیە ئەڵێی ژوور؟› ۲. ڕەهۆڵ؛ قووڵکەی ژێرزەوینی کە (بەتایبەت لە ئایینی زەردەشتدا) لاشەی مردوویان تێدا دەهێشتەوە ۳. *[ادبی]* گۆڕ؛ گلکۆ؛ قەبر؛ قەبرە.

**دخول** / doxûl, duxûl/: [عربی]/*اسم*. کار یان ڕەوتی تێڕۆیین؛ چوونەناوەوە؛ وە ژوورکەوتن؛ چوونە ژوورەوە؛ ئەنەدلێ لوەی.

**دخیل**[1] / daxîl/: [عربی]/*اسم*. ۱. لایەدە؛ بیانی؛ وشەیەک کە لە زمانێکی بیانیەوە هاتۆتە نێو زمانێکەوە ۲. /ـها/ پەڕۆشین؛ تەوەرک؛ پارچە یان بەنێک کە بۆ بەجێهاتنی نیاز بە قسن یان دارێکی پیرۆزەوەی دەبەستن: **دخیل بستن**

▣ **دخیل بستن** ☜ **دخیل**[1]**ـ۲**

**دخیل**[2]: *صفت*. بەشدار؛ دەستدار لە کارێکدا.

▣ **دخیل بودن**: بەشدار بوون؛ دەستدار بوون.

**دد** / dad ، ـان/: *اسم*. *[ادبی]* دڕ؛ دڕنە؛ دڕندە؛ لاور؛ گیانەوەری گۆشتخۆری کێوی (وەک شێر، پلنگ، گورگ و...).

**د.د.ت.** / de.de.te/: [فرانسوی]/*اسم*. دێ.دێ.تێ؛ ماکێکی سپی بۆندار کە بە شێوەی گەرد یان لە ئاو گیراوە بۆ لەنێو بردنی مێروو بەکار دەبرێ.

**ددر** / dadar/: *اسم*. *[کودکانە]* دەردەر: ۱. دەرەوە؛ جبەر؛ دەرەوەی ماڵ ۲. گەردش؛ گەڕان؛ گێلای.

**ددری** / dadarî ، ـها/: *صفت*. *[گفتاری]* گەڕاڵ؛ خوازیاری گەڕان و دوور بوون لە ماڵ ‹خیلی ددری شده و دیگر توی خانه آرام نمی‌گیرد: تەواو گەڕاڵ بووە و لە ماڵ بەن نابێ›.

**ددمنش** / dadmaneš ، ـان/: *صفت*. *[ادبی]* دڕ؛ دڕندە؛ دڕنە؛ خاوەن خووی جەنگەرانی.

**دده** / dade ، ـها/: [ترکی]/*اسم*. ۱. *[قدیمی]* دەدە؛ سەرناوێک بۆ کارەکەرانی ڕەشپێستی ناوماڵ ۲. *[نامتداول]* باوک؛ باب؛ تاتە.

**در**[1] / dar ، ـها/: *اسم*. درگا؛ دەرگا؛ دەرک؛ دەرکە؛ دریا؛ بەرە: ۱. کەرەسەیەک کە ڕێگەی

چوونه ناو یان هاتنه دەرەوەی جێگایەکە و باز و بەستە دەکرێ ‹در خانه: دەرگای ماڵ› ۲. سەر؛ زاربێن؛ دەرگابێن؛ دەرخون؛ دەرخۆنە؛ دەرخووینک؛ کەرەسەیەک کە بۆ بەستنی دەفرێک بە کار دەڕوا ‹در شیشه: دەرگای شیشە› ۳. *[مجازی]* چەمک یان ڕێگای گەیشتن بە شتێ یان جێیەک ‹در آشتی؛ در گفتگو: دەرگای ئاشتی؛ دەرگای وتوویژ› ٤. *[مجازی]* چەمک یان مەبەستی وتوویژ ‹از هر دری سخنی: لە هەر بەرەیەکەوە بابەتێک›.

**در اضطراری:** دەرکی ناچاری؛ دەرکەیەک کە بۆ دەرباز بوون لە کاتی مەترسیدا دانراوە.

**در آکاردئونی:** درگای ئاکاردیئونی؛ درگایێ کە تاکانی بە سەر یەکدا دەنووشتێنەوە.

**در ایستاده:** دەرکی ڕاوەستاو؛ درگایێ کە لە سەر یا خواریەوە بە چارچێوە لاولاوە دەکرێ و لە کاتی کرانەوەدا ئاسۆگی و لە بەستندا ئەستوونی دەوەستێ.

**در پیچی:** دەرگای پێچی؛ سەری پێچی؛ دەرکی پێچی؛ درگای چکۆلە کە بە پێچدان دەبەسرێ یان دەکرێتەوە.

**در تابخور:** دەرگای دوولایی؛ ئەو درگایە کە بە هەر دوو لادا (بەر و دوا) ئاوەلا دەبێ.

**در تاشو:** دەرگای چەن تایی کە تاکانی بە یەکەوە لکاون و تەنیا یەک تایان بە چوارچێوەکەوە پێوەند دراوە.

**در چرخان:** دەرگای چەرخان؛ درگایێ بە شێوەی دو پەڕەی یەکبڕ کە بە سەر پاژنەیەک لە بان و خوارەوە دەچەرخێ.

**در خروجی:** دەرگای دەرکەوتن؛ درگای چوونە دەر؛ ئەو دەرگایە کە بۆ چوونە دەرەوە لە شوێنێک دانراوە.

**در دولنگه:** دەرگای دووتایی؛ درگایێ کە لە دوو پەڕەی جیاواز دروستکراوە و هەردووکیان لە چوارچێوەیەکدا جێ خراون.

**در کرکره:** دەرگای کرکرە؛ ئەو درگایە کە بە ڕووی خۆدا لۆ دەخواتەوە یان کۆ دەبێتەوە.

**در کشویی:** دەرگای کەشاوی؛ ئەو درگایە کە بە کێشان بەرەو چەپ یان ڕاست دەکرێتەوە و دەبەسرێتەوە.

**در گیوه گشاد:** *[کنایی]* قنزل؛ تەپەلەوس؛ تەپلەوسە؛ تەوەزەل؛ تەمەڵ.

**در مخفی:** دەرکی شاراوە؛ دەرگایەک کە ڕوویان داپۆشیوە و بۆ کەسێ کە نەزانێ، نادیارە.

**در ورودی:** دەرگای سەرکەوتن؛ دەرکی چوونە ژوور؛ درگایەک بۆ ڕۆیشتنە ناو جێگەیەک، بەتایبەت دەرگای دەرەوەیی خانوو یان ساختومانێ کە بەرەو شەقام دەکرێتەوە.

**در باغ سبز نشان دادن:** *[مجازی]* دڵخۆش کردن؛ بە قسە بەهار هێنانە چۆکان؛ وادەی زل و پووچ دان ‹تو آن روز داشتی در باغ سبز به من نشان می‌دادی: تۆ ئەو ڕۆژە خەریک بووی دڵمت خوش دەکرد›.

**در به روی خود بستن:** *[کنایی]* دەرگا بە سەر خۆدا بەستن؛ درگا لەسەر خۆ داخستن؛ خۆ تورەمش دان؛ لەماڵەوە دانیشتن و لەگەڵ کەس هەڵسوکەوت نەکردن.

**در به روی کسی باز شدن:** *[مجازی]* دەرگا لە کەسێک کرانەوە؛ ڕێگەچارە بۆ گیر و گرفتێک پەیدا بوون ‹وقتی کار پیدا کردم همه‌ی درها به رویم باز شد: کە کارم دۆزیەوە هەموو دەرگایەکم لێ کرایەوە›.

**در به روی کسی بستن:** *[کنایی]* درگا لە سەر کەسێک داخستن؛ لە دیتنی کەسێ دووری گرتن.

**در به روی همان پاشنه بودن/ چرخیدن:** *[کنایی]* دۆخ هەمان دۆخ بوون؛ بۆ خاڵۆی دەستەوسان، چ گەرمێن و چ کێوسان؛ ئەگەر

جەژنە و ئەگەر ناوجەژنانە، مووچەی کەچەڵ هەر دوو نانە؛ حاڵ هەر ئەو حاڵە بوون ‹هنوز هم در به روی همان پاشنه است و هر روز با هم دعوا دارند: ئێستاکەش دوخ هەمان دوخە و هەموو ڕۆژێ شەڕیانە›.

**در جایی را گل گرفتن:** *[کنایی]* دەرگای شوێنێ لە قوڕ گرتن؛ درگای شوێنێ هەڕگ گرتن/ گرتنە هەڕگ؛ جێگایەک داخستن؛ هەڕ دەی تەموو چێوێویەرە ‹در این اداره را باید گل گرفت: دەرکی ئەم مەزرینگەیە ئەبێ لە قوڕ گیری›.

**در دهن را چفت کردن:** *[مجازی]* دۆڵمەیەکی چەور لە زار نان؛ زۆر دەم نەدان؛ فرەوێژی و زۆربلێیی نەکردن ‹می‌خواهم در دهنت را چفت کنی: ئەمەوێ دۆلمەیەکی چەور لە زارت نیی›.

**در را از پاشنه درآوردن:** *[کنایی]* درگا گرتنە کۆڵەوە؛ دەرگا لە ڕێسمە هێنان؛ دەرک لە ڕێسمە دەرهێنان: ۱. بە پەلە و بەلەز دەرگا کوتان ‹داشتند در را از پاشنه درمی‌آوردند: خەریک بوون درگاکەیان دەگرتە کولەوە› ۲. زۆر بە تاسە و تەمای شتێک بوون ‹خواستگاران دخترش، در را از پاشنه درآوردند: داواکارانی کچەکەی، درگای ماڵیان لە ریسمە دەرهینابوو›.

**در زدن:** لە دەرگا دان؛ دەرکە کوتان؛ دەرگا تەقانن؛ دەرگا لێدان بۆ چوونە جێگایەک ‹در می‌زنند یکی در را باز کند: لە درگا دەدەن یەکێ بیکاتەوە›.

**در کسی را کوبیدن:** *[کنایی]* بۆ کارێ لای کەسێ چوون؛ ڕوو نان لە کەسێ؛ ڕوو لە یەکێ خستن؛ بەرەو یۆی ئەوەلەقنەی.

**در کوزه گذاشتن (و آبش را خوردن):** *[مجازی]* نانە تاق (و چاوکردنە زاق)؛ بەبێ قازانج و لێهاتوویی بوون ‹این قولنامە را باید در کوزە گذاشت: ئەم بڕیارنامەیە دەبێ بنیتە تاقەوە›.

**درگوشی حرف زدن:** پچە کردن؛ چفە کردن؛ پچە-پچ کردن ☜ **درگوشی**

**در و تخته به هم جور بودن** ☜ **درُ و تخته**

**دری به تخته خوردن:** *[مجازی]* خوای تۆ کردن؛ با لە بارێکەوە هاتن؛ ڕووداوێک (زۆرتر خۆش) ڕوودان ‹دری به تخته خورد و برادرم رفت سرکار: خوای تو کردی و براکەم چووە سەری کار›.

**از در آشتی درآمدن:** *[مجازی]* بۆ ئاشتی کوتان؛ لە بیری ئاشتیدا بوون.

**از هر دری سخن گفتن:** *[مجازی]* هەر تیرێک لە کەندالێک؛ لە هەرچی جۆرە وتن؛ لەمەڕ هەر شتێکەوە دوان.

**به این در و آن در زدن:** *[کنایی]* ئەم لا و ئەو لا کردن؛ هەموو درگایەک کوتان؛ بۆ لای خەڵکی و جێگای جۆراوجۆر (بۆ گەیشتن بە مەبەست) چوون ‹آن‌قدر به این در و آن در زدیم تا آخر این خانه را پیدا کردیم: ئەوندە ئەم لا و ئەو لامان کرد تا ئاخری ئەم ماڵەمان دۆزیەوە›: **به هر در زدن**

**به در گفتن که / تا دیوار بشنود:** *[مجازی]* بە دار وتن با دیوار بژنەوێ؛ بۆکێ لەگەڵ تۆمە، خەسوو گوێ بگرە؛ بۆ تێگەیاندنی کەسێ لە بابەتێک، بە یەکێکی‌تر گوتن.

**به هر در زدن** ☜ **به این درُ و آن در زدن**

**همه‌ی درها را بسته یافتن:** *[کنایی]* هەموو دەرگایێ بە سەردا بەسران؛ پەیدا نەکردنی ڕێگەیەک بۆ بە مەبەست گەیشتن ‹وقتی که همه‌ی درها را بسته یافتیم، ناچار پیش شما آمدیم: کاتێ کە هەموو دەرگایێ بە سەرماندا بەسرا، ناچار هاتین بۆ لای ئێوە›.

**در** [۲]: *حرف.* لە؛ جە؛ نە؛ د؛ ژ: ۱. دلێو؛ ئەنە؛ ناوی شتێک ‹در جیب؛ در خانه؛ در کوزە: لە گیرفان؛ جە یانە؛ ژ گۆزک› ۲. بە ‹در فکر کار آیندەام بودم: لە بیری کاری داهاتوومدا بووم› ۳. سەبارەت؛ لەمەڕ ‹در آن بارە با رییس حرف زدم: لە ئەو بارەوە لەگەڵ

سەرۆکدا قسەم کرد› ٤. بار و چۆنیەتی ‹در دست ساختمان: لـە هـەرەتی کردنـەوەدا› ٥. کـات؛ دەم؛ گاف؛ ئەنە؛ بەند ‹در شب؛ در زمستان: لە شـەودا؛ لـە زستاندا› ٦. دەر؛ ئەنە؛ بـار و پیـداگری بەلـەزی ‹در دم: لە پرتا› ٧. [مخفف] لە؛ زەرب لە؛ زەربدەر ‹سه در چهار، می‌شود دوازده: سـێ لـە چـوار، ئەبێتـە دوازده› ٨. لا؛ لایەنی؛ لە ڕوانگەی ‹ربا در اسلام حرام است: سووخۆری لە ئیسلامدا حەرامـە› ٩. لـە؛ بۆ دەربڕینی هەندی شتێک لە ئاست هەمووییدا ‹یک در هزار: یـەک لـە هـەزار› ١٠. بـەرەو؛ ڕووەو؛ بەرەو لای ‹روی در روی دوست کـن!: ڕوو لـە ڕووی یار کە!› ١١. [قدیمی] بە ‹در هفت باب: لـە حـەوت بابەتدا›.

▣ **در اثنای:** لە کاتی؛ دلێو؛ لە ڕەوتی (کارێ یان ڕووداوێکدا) ‹در اثنای عروسی مریض شدم: لە کاتی زەماوەندا نەخۆش کەوتم›.

**در آنِ واحد:** هـەر لـەجێ؛ دەرلاد؛ لـە یـەک دەمدا ‹در آنِ واحد هر دو را گرفت: هـەر لـە جـێ هەردووکیانی گرت›.

**در این اثنا:** لە هەمان کاتدا؛ هەر لـەو کاتـەدا؛ لـەو ناوەنـاوەدا؛ چـی بەینەنـە؛ لـە ڕەوتی ڕووداوێکدا ‹در این اثنا مدیر هم آمد: لـە هـەمان کاتدا سەرۆکیش هات›.

**در برابرِ:** لە بەرانبەر؛ لە بەرامبـەر؛ ژ هەمبـەر؛ وەروو؛ وەراوەروو؛ جە وەراوەروو: ١. لە ڕووی ‹در برابر آیینه ایستاده بـود: لـە بەرانبـەر ئاوێنـەوە ڕاوەستابوو› ٢. بە جێی؛ لـە جێگـای ‹در برابـر کاری که می‌کنی پول می‌گیـری: لـە بەرانبـەر ئـەو کارەوە دەیکەی پارە وەردەگری› ٣. لە حاسـت؛ لە ئاست؛ لـە عـان؛ لـە حـان؛ لـە حانـد؛ لـە پێوەندی لەگەڵ ‹همه در برابـر قـانون مـساویند: هەموو لە بەرانبەر قانوونەوە بەرامبەرن›.

**در حدودِ:** نێزیک بە؛ نێزیک؛ نزیک؛ نزیک بە؛ لە دەور و بەری؛ نزیکەو؛ نزیکەی ‹در حدود صد متر: نیزیک بە سەد میتر›.

**در حینِ:** لە کاتی؛ لە ئـانی؛ لـە چـاخی؛ تـان؛ گاف؛ وەختوو؛ لە وەخت ‹در حین کار سرم گیج می‌رفت: لە کاتی کاردا سەرم گێژی دەخوارد›.

**در ضمنِ:** ویڕای؛ پێڕای؛ چەنی؛ چنی؛ هاوڕێ لەگەڵ ‹در ضمن گفتگو چای هم آماده شد: ویـڕای وتوویژ چایش پێگەیشت›.

**در طولِ:** لە؛ جە؛ ژ؛ لە ماوەی؛ بە درێژایی ‹در طول یک شب: لە شەوێکدا›.

**در طیِ:** لە ماوەی؛ بە درێژایی ‹در طی ٢ سـال: لە ماوەی ٢ ساڵدا›.

**در ظرفِ:** نێوان؛ لە ماوەی؛ لە نێوان؛ دلێو ‹در ظرف یک هفته: نیوان حەوتەیەک›.

**در عرضِ:** لە مەودای؛ لە ماوەی؛ لـە درێژایـی ‹در عرض یک ماه: لە مەودای مانگێکدا›.

**در قبالِ:** لە بەرانبەر؛ لە بەرامبـەر؛ ژ هەمبـەر؛ وەراوەروو؛ لـە حاسـت؛ لـە ئاسـت؛ لـە حـان ‹رفتارش در قبال دیگران تکبرآمیز است: ئاکاری لـە بەرانبەر دیترانەوە لووتبەرزانەیە›.

▣ **در/ توی آستین داشتن:** [کنایی] لـە گیرفانـدا بـوون؛ لـە باخەڵـدا بـوون؛ باخەلەنـە بیـەی؛ پێبوون.

**در برداشتن:** گرتنەوە؛ لە خۆگرتن؛ تێدا بوون؛ لەگەڵ خۆدا هەبوون ‹مقاله چهار موضوع اصلی را در برداشـت: وتارەکـە چـوار بابـەتی سـەرەکی دەگرتەوە›.

**در بر کردن:** [ادبی] لە بـەرکردن؛ دەبـەرکردن؛ کردنە بەر؛ ئەنەکەردەی؛ کەردەینە؛ کـەردەی وەر؛ پۆشان ‹جامەی رزم در برکرد: بەرگی شـەڕی لە بەرکرد›.

**در برگـرفتن:** [ادبـی] لـە ئـامێزگرتن؛ گرتنـە ئامێزەوە؛ لە بـاوەش‌گـرتن؛ گێرتەینـە واشـی ‹فرزندش را در برگرفت و او را بوسید: منداڵەکەی لە ئامێزگرت و ماچی کردەوە›.

**در بند چیـزی/ کـسی نبـودن:** پایـەی شـتێ/ کەسـێ نـەبوون؛ دەروەن شـتێ/ کەسـێک

نەبوون؛ دەربایس نەبوون؛ لە بەندی شتێک/ کەسێکدا نەبوون؛ بایەخ پێنەدان ‹زیاد در بند پول نبود: ئەوندە پایەی پارە نەبوو›.

**در پوست خود نگنجیدن:** *[مجازی]* بال دەرهێنان؛ گەزـگەز/ گەش‌ـگەش بالا کردن؛ شاگەشکە بوون/ کردن؛ هەست بە شادی و خۆشیەکی یەکجار زۆر کردن ‹از خوشحالی در پوست خودش نمی‌گنجید: لە خۆشیان خەریک بوو باڵ دەربێنێ›.

**در پی چیزی بودن:** بە دوای شتێکەوە بوون؛ بە شوێن شتێکەوە بوون؛ شۆنۆ چێویەوە بیەی ‹در پی آن بود کە کاری پیدا کند: بە دوای ئەوەوە بوو کارێک بدۆزێتەوە›.

**در پیش بودن/ داشتن:** لە بەردا بوون؛ لە پێشدا بوون؛ وەرە ڕانە بیەی؛ لە ڕێگە یان ماوەی داهاتوودا بوون ‹کارهای زیادی در پیش داریم؛ راه درازی در پیش داریم: کارگەلێکی زۆرمان لە بەرە؛ ڕێگایەکی درێژمان لە پێشە›.

**در پیش گرفتن:** گرتنە بەر؛ وەکوو ڕێگای جووڵانەوە و شێوازی ئاکار هەڵبژاردن ‹راه خانە را در پیش گرفت: ڕێگای ماڵی گرتە بەر›.

**در دست بودن:** هەبوون؛ لە دەستدا بوون؛ دەسەنە بیەی؛ لە بەردەستدا بوون ‹خبرهایی از او در دست است: هەواڵگەلێکی لێ هەیە›.

هەروەها: **در دست داشتن؛ در دست گرفتن**

**در درست کسی بودن:** ☜ دست کسی بودن، دست

**در طبق اخلاص نهادن:** *[مجازی]* دریغی نەکردن؛ درێخ نەکردن؛ هیچ نەشاردنەوە؛ تەیار بوون بۆ بەخشین بە کەسێک ‹او هر چە داشت در طبق اخلاص نهاد: هەر شتێکی هەبوو دریغی نەکرد›.

**در کاری دماغ سوزاندن:** *[مجازی]* خۆ بە کارێکەوە پیر کردن؛ بە سەر و ماڵ دەکارێکەوە چوون؛ خۆبۆ کارێک ماندوو کردن؛ بەو بۆنەوە زەحمەت‌کێشان.

**در معرض چیزی بودن:** لە (هەمبەر) شتێکدا بوون؛ لە بەر شتێ بوون؛ ڕووبەڕوو بوونەوە؛ لە بەرانبەر کارتێکەری شتێکدا بوون ‹خانە در معرض خرابی بود: خانووەکە لە ڕووخاندا بوو›.

**درـ**[۳]: *پیشوند.* دەرـ ؛ بەرـ : ۱. ڕۆیشتنە دەرەوە یان کردنە دەرەوە ‹درآمدن؛ درکردن: دەرهاتن؛ دەرکردن› ۲. بار و چۆناوچۆنی ‹درشدن؛ درهم شدن: بەرشیەی؛ دەرهەم بوون›.

▣ **در شدن:** ۱. پاک‌لەپاک بوون؛ دەر بوون؛ داشکیان ‹این بە آن در شد: ئەمە بەوە پاک‌لەپاک بوو› ۲. *[ادبی]* چوونە دەرەوە؛ ڕۆیشتن بۆ دەرەوە؛ لوای بەر؛ ئەرەزیەی؛ زیایرە.

**در کردن:** ۱. دەرکردن ‹خستگی درکردن: ماندوویەتی دەرکردن› ۲. هاویشتن؛ خستن؛ شانای؛ شەنەی؛ پەرت‌کردن ‹تیر درکردن: تیر هاویشتن›.

**ـ درـ**[۴]: *میانوند.* ــ ایــ ؛ ــ اــ ؛ ــ لەــ ؛ ــ اوــ ؛ نیشانەی چۆناوچۆنی یان دۆخێک ‹پی‌درپی: پەساپەس›.

**ـ در**[۴]: *پیواژە.* ــ دڕ؛ دڕندە؛ هەڵدڕێن ‹پردەدر: پەردەدڕ›.

**در** / dor(r)/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* دڕ؛ دوڕ؛ گەوهەر؛ گەوەر.

**درآمدن** / darāmadan/: *مصدر. لازم. متعدی.* //**درآمدی:** دەرهاتی؛ **درمی‌آیی:** دەردێی؛ **دربیا:** دەربێ (دەرێ)// دەرهاتن؛ دراتن: ☐*لازم.* ۱. هاتنە دەر/ دەرەوە؛ بەرئامەی؛ بەرئامای؛ ئەرەزیەی؛ زیایرە؛ لە جێگایەکی (زۆرتر داخراو) دەرکەوتن ‹از خانە درامدن؛ از چاە درامدن: لە ماڵ دەرهاتن؛ لە چاڵاو دەرهاتن› ۲. هەڵاتن؛ هەڵهاتن؛ دەرکەوتن؛ بەرئامەی؛ بەرئامای؛ کەفتنە دەشتەوە؛ زیەی؛ زیای ‹درامدن ماە: دەرهاتنی مانگ› ۳. ڕوان؛ هاتنە دەر؛ سەر هەڵدان؛ سەوز بوون؛ ڕسەی؛ بەرئامەی؛

بەرئامای؛ زیەی؛ زیای؛ شین بوون ‹ریش درامدن؛ گــل درامــدن: ڕدێــن دەرهــاتن؛ گــوڵ دەرهــاتن› ٤. ئامانجدان؛ بەرئامەی/ ئامای ‹بد درامدن؛ درست درامدن: خراپ دەرهاتن؛ درووس دەرهــاتن› ٥. بــە دەست هاتن؛ بەرئامەی/ ئامای ‹پول درامــدن؛ آب درامدن: پارە دەرهاتن؛ ئاو دەرهاتن› ٦. دەرکەوتن؛ بەدیهاتن؛ بەرئامەی/ ئامای؛ زیەی؛ زیای ‹از پایم میخچە درامدە بــود: لــە پێمــدا مێخچــە دەرهــاتبوو› ٧. لە چاپ دران؛ دریایوە بــەر؛ چــاپ یــان بــلاو بوونــەوە ‹روزنامــە درامــدن؛ کتــاب درامــدن: ڕۆژنامــە دەرهاتن؛ کتێب دەرهاتن› ٨. داهاتن؛ بوونــە بــاو؛ باو بوون یان داهێنران ‹مدهای تازە درامدن: مودی تازە دەرهاتن› □ *متعــدی*. ٩. *[گفتــاری]* وێسانەوە؛ وەستانەوە؛ بەرهەڵست بوون ‹جلو کسی درامــدن: لە بەرامبەر کەسێدا وێسانەوە› ١٠. *[ادبی]* چوونــە ناو جێگایەک ‹بە گرمابە درامد: چــووە حەمامــەوە›.

هەروەها: **درآمدنی**

■ صفت مفعولی: **درآمده** (دەرهاتوو)/ مــصدر منفــی: **درنَیامدن** (دەرنەهاتن)

**درآمیختگی** / darāmîxtegî/ ☜ **آمیختگی**

**درآمیختن** / darāmîxtan/ ☜ **آمیختن**

**درآمیخته** / darāmîxte/ ☜ **آمیخته**

**درآوردن** / darāvardan, darāvordan/: *مــصدر. متعدی. لازم.* // **درآوردی:** دەرت هێنــا؛ **درمــی آوری:** دەردێــنی؛ **دربیــاور/ بیــار:** دەربێنــە// دەرهێنــان؛ دەرهــاوردن؛ دەرئــانین؛ دەرهــانین: □ *متعــدی*. ١. بەرئاردەی؛ شتێ لە جێگایەکەوە کێشانە دەر ‹از جیــب درآوردن؛ از چــاه درآوردن: لــە گیرفــان دەرهێنــان؛ لــە چــا دەرهــاوردن› ٢. داکەنــدن؛ کەندن؛ شەلان؛ ئاژین؛ وەتەی؛ جــلوبــەرگ لــە بەر دەرهێنان ‹پیراهن خود را درآوردن: کراسی خــۆ داکەنــــدن› ٣. *[گفتــــاری]* لــــە چــاپ دان؛ نووســراوەیەک چاپ و بلاوکردنــەوە ‹خلاصــەی کتــاب را درآوردن: کورتــەی کتێــب دەرهێنــان› ٤. ڕوونکردنەوە؛ وتار یان مەبەســتێک لــە نێــو چەنــد دەیتــاوە بــە دەسهێنان ‹حساب کــسی را درآوردن: حەسابی کەسێک دەرهێنــان› ٥. بــەڕێوە بردن؛ بەڕێبردن؛ ڕۆنان؛ بۆ نومــایش دانــان ‹ادا درآوردن: ئــین دەرهێنــان› ٦. شــتێک بــە دەس هێنــان ‹پــول درآوردن؛ محــصول درآوردن: پــووڵ دەرهێنــان؛ داهــات دەرهێنــان› ٧. *[گفتــاری]* درووس کــردن؛ هەڵبەســتن؛ وەش کــەردەی ‹برایش حرف درآوردند: قسەیان بۆ دەرهێنا› □ *لازم*. ٨. بەرئاردەی؛ زنیەی؛ ڕوانی گیا، موو، شاخ یان ددان ‹ریش درآوردن؛ گل درآوردن: ڕدێن دەرهێنــان؛ گوڵ دەرهینان›. هەروەها: **درآوردنی**

■ صــفت فــاعلی: **درآورنــده** (دەرهێنــەر)/ صــفت مفعــولی: **درآورده** (دەرهێنــراو)/ مــصدر منفــی: **درنَیاوردن** (دەرنەهێنان)

**درآویختــــن** / darāvîxtan/: *مــصدر. متعــدی.* // **درآویختـــی:** هەڵواســـیایت؛ **درمـــی‌آویـــزی:** هەڵدەواســـیێت؛ **درآویـــز:** هەڵواســـیە/// *[ادبـــی]* ١. هەڵواســین؛ هەڵواســیان؛ دەلالــە کۆچکــێ بوون؛ شتێ بە دەســتگــرتن و پێیــەوە ئــاوێزان بوون ‹بە تختەپارەای درآویخت: بــە کوتــە دارێکــەوە هەڵواسیا› ٢. *[مجازی]* چنگاوش بــوون؛ دەســتەو ئێخە بــوون ‹بــدو درآویخــت و بــر سـرش مــشتی زد: چنگاوشی بوو، مشتێکی لە سەری دا›.

■ صفت مفعولی: **درآویختــه** (هەڵواســراو)/ مــصدر منفی: **درنَیاویختن** (هەڵنەواسران)

**دراب** / darāb/: *اسم.* پاشاراو؛ ئاراو؛ دەراو؛ ئــاوی دەردراو لە ڕەوتێک (وەکوو دەردانی ئاوی ئەســتێر یان شۆردنەوە). بەرانبەر: **ریزاب**

**درایه** / d(e)rāpe ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* دراپێ؛ لەتــە پارچــەی جوانکــاری ئــاوێزان کــە بــۆ خەملانــدنی پــەردە و موبــل یــان ئێخــەی جلوبەرگ بە کار دەڕوا.

**دراج** / dorrāc ، ـهــا؛ ـان/: [عربــی]/*اسم.* دوراج؛ ئاقدەل(نێر)؛ گەڤرک(مێ)؛ ئایکناســە؛ زێوەکــەو؛ پۆڕ؛ کەناچە؛ سوێسکەڕەشە؛ باڵندەیەکی تــۆزێ

گەورەتر لە کەوە بە دەنگێکی بەرز و خۆش، باڵی کورت و خڕ و پای درێژ و دەندووکی کورت، لە گوێ ئاو و ناو بێشەڵاندا دەژی و گۆشتی خۆشە.

**دراز** / derāz ، ـها/: *صفت.* درێژ؛ درێژ: ١. بە درێژاییێکی زۆر زیاتر لە پانەیی ‹چوب دراز؛ میخ دراز: چێوی درێژ؛ بزماری درێژ› ٢. بە درێژایی یان مەودای زۆرەوە ‹راه دراز: ڕێگەی درێژ› ٣. *[گفتاری]* باڵابەرز؛ دڕا ‹آدم دراز: مرۆی درێژ› ٤. *[ادبی]* دوور و درێژ؛ زۆر؛ درێژخایێن؛ بە ماوەی زۆرەوە ‹سالهای دراز: سالانێکی دوور و درێژ›.

▣ **دراز به دراز افتادن:** پان بوونەوە؛ پانەوپان کەوتن؛ درێژ بوونەوە؛ لە پەڕوو ئەرەئیژیەی ‹دراز به دراز افتاده بود وسط اتاق: لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا پان ببووەوە›.

**دراز شدن:** درێژ بوونەوە؛ درێژەوە بوون: ١. درێژایی زۆر پەیداکردن ‹آستینش خیلی دراز شده: قۆڵەکەی زۆر درێژ بۆتەوە› ٢. درێژەدار بوون؛ مەودای شتێ زۆر بوونەوە ‹در بهار روزها دراز می‌شود: لە بەهاردا ڕۆژگار درێژ دەبێتەوە› ٣. *[گفتاری]* پاڵ کەوتن؛ پاڵ کەفتن؛ هەڵاژیان؛ ڕازان؛ ئیژیایرە؛ بە باری خەوتوودا بوون ‹دراز شد روی تخت: لە سەر تەختەکە درێژەوە بوو›.

**دراز کردن:** درێژەوەکردن؛ درێژکردنەوە: ١. دانە دەم شتێکەوە؛ لە دوودان و درێژکردن ‹دامنش را کمی دراز کن: داوێنەکەی تۆزێ درێژکەوە› ٢. ڕاکێشان؛ شتێکی درێژ بۆ لایەک بردن ‹دستش را به طرفم دراز کرد: دەستی بەرەو لام درێژکردەوە› ٣. ڕاکشاندن؛ ئەرەئیژیەی؛ شتێکی درێژ بەلادا خەواندن ‹چوب را دراز کرد روی زمین: دارەکەی لە سەر زەوی درێژکردەوە›.

**دراز کشیدن:** ڕاکشان؛ ڕازین؛ ڕازان؛ ڕاژان؛ ڕاکەوتن؛ ڕاکەتن؛ ڤەکەتن؛ کەرانددش؛ ئەرەئیژیەی؛ هەڵاژیان؛ ئلاژیان؛ ئلاژیای؛ هەڵاژین؛ خڕکین؛ پاڵ کەوتن؛ پاڵ کەفتن؛ درێژ بوون؛ خۆ لەگەزدان؛ بە باری خەوتوویدا کەوتن، بەتایبەت بۆ حەسانەوە ‹کمی روی تخت دراز کشیدم: لە سەر تەختەکە هێندێک ڕاکشام›.

**درازا** / derāzā/: *اسم.* درێژا؛ درێژایی؛ درێژی؛ درێژە؛ درێژای: ١. سۆ یان لای درێژتر یان درێژترین لای شتێک. بەرانبەر: **پهنا** ‹قالی را به درازایش بینداز: قالیەکە بە درێژادا داخە› ٢. ئەندازەی کێشراوی یان درێژی شتێ بە پێی یەکەی پێوانەی درێژایی ‹درازای این اتاق چهار متر است: درێژایی ئەم دیوە چوار میترە›.

**درازدست** / derāzdast ، ـها؛ ـان/: *صفت.* دەس‌درێژ؛ دەست‌درێژ: ١. درێژەدەست؛ بە دەست و باسکی کێشراوەوە ٢. *[مجازی]* سەرکەوتوو.

**درازدستی** / derāzdastî ، ـها؛ ـان/: *اسم. [مجازی]* دەسدرێژی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی دەست بردن بۆ مافی دیتران.

**درازعمر** / derāz'omr/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[قدیمی]* تەمەن‌درێژ؛ عومردرێژ؛ عەمردرێژ؛ خاوەن تەمەنی زۆر.

**درازکش** / derāzkeš/: *اسم.* دەمەڕوو؛ دەمەوڕوو؛ لەپەڕوو؛ کاری بە زگدا لە سەر زەوی خەوتن.

**درازگوش** / derāzgûš ، ـها؛ ـان/: *اسم. [ادبی]* کەر؛ هەر؛ خەر؛ گوێدرێژ.

**درازگویی** / derāzgûyî/: *اسم.* درێژدادڕی؛ فرەوێژی؛ زۆربێژی؛ چەنەبازی؛ وڕاجی؛ دۆخ یان چۆنیەتی زۆر دوان.

**درازمدت** / derāzmoddat/: [فارسی/ عربی] *صفت.* زۆرخایێن؛ درێژخایەن؛ بە ماوەی زۆرەوە. بەرانبەر: **کوتاه‌مدت** ‹بیماری درازمدت؛ وام درازمدت:

نەخۆشینی درێژخایەن؛ وامی دورخستن›.

**درازنا** / derāznā/: *اسم. [ادبی]* درێژایی؛ درێژا؛ درێژی؛ درێژە؛ درێژایی شتێک ‹درازنای جاده؛ درازنای شب: درێژایی جاده؛ درێژایی شەو›.

**درازنویسی** / derāznevîsî/: *اسم.* درێژنووسی: ١. بار یان چۆنیەتی نووسینی زۆر و پڕ لە پەراوێز و بێ‌جێ ٢. بار یان چۆنیەتی نووسینی ڕستەگەلی درێژ.

**درازی** / derāzî/: *اسم.* درێژی؛ درێژایی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی درێژ بوون ‹روز بە این درازی داشتی چە می‌کردی؟: ڕۆژ بەم درێژیە خەریکی چ بووی؟› ٢. درێژایی؛ درێژا ‹پارچە را از درازی ببرا: پارچەکە بە درێژایدا ببڕە!›.

**دراژە** / darāže/: [فرانسوی] *اسم.* قورس؛ حوب؛ حەب؛ دەرمانی وشکی وەک پوولەکەی هێندێک ئەستوور دەرهاتوو.

**درافتادن** / daroftādan/: *مصدر. لازم.* //**درافتادی:** ئاوقا بووی؛ **درمی‌افتی:** ئاوقا دەبی؛ **دربیفت:** ئاوقا بە// ئاوقا بوون؛ ئاوقان بوون؛ دەگژراچوون؛ بەلشین؛ ئامباز بوون؛ بە شەڕ هاتن؛ هەلپڕژان؛ هەلچڕژان؛ تێک‌هالان؛ تێکەلاو بوون؛ کێشمانەکێش کردن؛ گژیەی؛ گژیای؛ لەگەڵ کەس یان دەستەیەکدا شەڕکردن ‹با این اوباش درافتادن در شأن تو نیست: لە تۆ جوان نیە ئاوقای ئەم لات و لووتانە بی›.

■ مصدر منفی: **درنَیفتادن** (ئاوقا نەبوون)

**درافشانی** / dorafšānî/: [عربی/ فارسی] ☜ **دُرفشانی**

**دراکە** / darrāke/: [عربی] *اسم.* فام؛ توانایی تێگەیشتن؛ ئاوزین.

**درام** / d(e)rām، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* درام؛ شانۆنامە یان فیلمنامەیەک کە هەر چەشنە ڕووداوێکی، خەمینی یان پێکەنینی تێدایە بێ ئەوەی شێوەی تراژێدی یان کومێدی بدا.

◘ **درام شدن وضع:** *[کنایی]* تێکچوون؛ ئالۆز بوون؛ ئالۆزان؛ خراپ بوونی بار و دۆخ ‹وضع آزاد خیلی درام شده: حاڵ و باڵی ئازاد تەواو تێکچووە›.

**دراماتیک** / d(e)rāmātîk، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* دراماتیک: ١. سەر بە درام ٢. شانۆیی؛ شانۆکی؛ نومایشی ‹هنرهای دراماتیک: هونەرگەلی دراماتیک›.

**درامد** / darāmad، ـها/: *اسم.* داهات؛ دەسکەوت؛ دەخڵ؛ بارەچە؛ ئەوی کە کەس یان مەزرینگەیەک لە ماوەیەکی دیاریکراودا لە بەرانبەر فرۆشی کالا یان ڕاژەدا دەستی دەکەوێ ‹آن مغازە درامد چندانی ندارد: ئەو دووکانە داهاتێکی وای نیە›.

◘ **درامد سرانە:** داهاتی سەرانە؛ مامناونجی دەسکەوتی تاکەکەسێک لە ولاتێکدا لەوەی بەدیهاتووە.

**درامد ملی:** داهاتی نەتەوەیی؛ داهاتی گەلی؛ سەرجەمی داهاتی ولاتێک.

**دراندن** / darāndan/: *مصدر. متعدی.* // **دراندی:** دڕاندت؛ **می‌درانی:** دەدڕێنی؛ **بِدران:** بدڕێنە// *[ادبی]* ١. دڕاندن؛ دڕانن؛ زڕاندن؛ چڕاندن؛ دەرزاندن؛ پەرساندن؛ دادڕاندن؛ هلهاندن؛ هەلمێنان؛ دڕنەی؛ دڕنای؛ هۆڕئاردەی؛ بوونە هۆی دڕانی شتێ ‹جامە دراندن: جل‌وبەرگ دڕاندن› ٢. *[کنایی]* داچەقاندن؛ ئەرەدڕنەی؛ زۆر بازکردن ‹چرا آن‌طور چشمهایت را می‌درانی؟: بۆچی وا چاوت دادەچەقێنی؟› * **درانیدن**. هەروەها: **دراندنی**

■ صفت مفعولی: **دراندە** (دڕێنراو)/ مصدر منفی: **نَدراندن** (نەدڕاندن)

**درانیدن** / darānîdan/ ☜ **دراندن**

**دراور** / d(e)rāver/: [انگلیسی] *اسم.* دراوێر؛ کەشاوی؛ مجەر؛ مەجەڕ؛ جۆرێ کومید، تەنیا بە چەن کەشاوەوە.

**دراویدی** / derāvîdî/: *اسم.* دیراویدی: ١. ـها؛ ـان/ ڕەگەزی سپی پێستی بوومی باشووری

هیندوستان که ئاریایی نین ٢. دەستەیەک لە زبانگەلی باو لە هێند، سریلانکا و پاکستاندا کە بریتین لە زمانگەلی تامیل، تۆلۆگۆ، گوندی و مالایالام.

**دراویش** / darāvîš/: [عربی] جمعِ ☜ **دَرویش**

**درایت** / derāyat، ـها/: [عربی]/اسم. تێگەیشتووی؛ ئاوەزمەندی ‹برای این کار هوشیاری و درایت لازم است: بۆ ئەم کارە وشیاری و تێگەیشتووی پێویستە›.

**درایو** / d(e)rāyv/: [انگلیسی] ☜ **دیسک‌گردان**

**درایوین سینما** / d(e)rāyvînsînemā، ـها/: [انگلیسی]/اسم. درایوین سینەما؛ سینەما لە جێگایەکی ئاوەڵادا کە بە ماشێنەوە تێ دەچن و سەیری فیلم دەکەن.

**درایه** / darāye، ـها/: [عربی]/اسم. لێما؛ سەر وشە؛ وشە یان بابەتێک بەتایبەت لە فەرهەنگ، پێرست یا کتێبی سەرەکیدا کە زانیاریگەلێک لە بارەیەوە نووسراوە.

**درب** / darb، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] دەرگا؛ درگا؛ دەرکە؛ دریا؛ بەرە ‹درب را آهسته ببندید: دەرگاکە هێواش بدەنەوە›.

**درباختن**/ darbāxtan/ ☜ **باختن ١و٣**

**دربار** / darbār، ـها/:/اسم. دەربار: ١. ئەو شوێنە کە شا بەرایی دەدا بچنە دیمانەی ‹در دربار رفت و آمد داشت: هات و چۆی دەرباری دەکرد› ٢. تەواوی ئەو کەسانەی کە پێوەندیان لەگەڵ شادا هەیە ‹دربار در هر کاری دخالت داشت: دەربار لە هەموو کارێکدا دەستی هەبوو› ٣. کۆشکی شایی؛ کاخی پاتشایی.

**دربازکن** / darbāzkon، ـها/:/اسم. ١. ئامرازێکی کارەبایی بۆ کردنەوەی دەرگا لە دوورەوە ٢. کەرەستەیێک بۆکردنەوەی دەرگای قوتوو، بوتری و...

**دربان** / darbān، ـها؛ ـان/:/اسم. دەرکەوان؛ درکەوان؛ دەرگەوان؛ دەربان؛ درگاوان؛ دەروازەوان؛ دەروان؛ قاپیوان؛ قاپچی؛ کۆک؛ خزمەتکارێ کە لە پشت یان لای دەرگاوە دەوەستێ و چاوەدێری هاتوچۆ دەکا ‹دربان جلو ما را گرفت و کارت شناسایی خواست: دەرکەوان بەرمانی گرت و داوای پێناسەی کرد›.

**دربانی** / darbānî/:/اسم. دەرکەوانی؛ درکەوانی؛ دەربانی؛ دەروازەوانی؛ دەروانی؛ قاپچیوانی؛ قاپیوانی؛ کار یان پیشەی دەرکەوان.

**دربایست** / darbāyest/: صفت. [ادبی] پێویست؛ پێویس؛ جێ‌نیاز؛ یاگۆ نیازی.

**دربدر** / darbedar، ـها/: صفت. دەربەدەر؛ دەروەدەر؛ دەرەندوو؛ ئاوارە؛ بێلیقە؛ مەرزێر؛ بەرەزە؛ ڕەبەن؛ تەرە؛ باشیلا؛ لانەواز؛ هەڵوەدا ‹جنگ خیلی‌ها را دربدر کرد: شەڕ زۆری دەربەدەرکرد›.

**دربدری** / darbedarî، ـها/:/اسم. دەربەدەری؛ دەروەدەری؛ دەرەندوویی؛ بەرەزەیی؛ ڕەبەنی؛ ئاوارەیی؛ هەڵوەدایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دەربەدەر و ڕەبەن بوون ‹پس از ده سال دربدری به شهرمان برگشتیم: دوای ١٠ ساڵ دەربەدەری گەڕاینەوە بۆ شارەکەمان›.

**دربر** / darbar/ ☜ **بَر[2]ـ٣**

**دربردن** / darbordan/: مصدر. متعدی.// **دربردی:** پەڕاندتەوە؛ **درمی‌بری:** دەپەڕێنیتەوە؛ **دربِبر:** بپەڕێنەوە// پەڕاندنەوە؛ دەرکردن؛ ڕزگارکردن؛ دەربازکردن؛ ئەوەپرنەی؛ پرنایوە؛ بە بردنی شتێ یان کەسێ، لە گەزن، مەترسی یان دەست پێ‌گەیشتن دوورکردنەوە ‹او توانست چیزهای باارزشی را از آتش‌سوزی دربرد: ئەو توانی شتگەلێکی بایەخدار لە سووتمانەکە بپەڕێنێتەوە›. هەروەها: **دربودنی**

■ مصدر منفی: **درنَبردن** (نەپەڕاندنەوە)

**دربست**[1] / darbast/: صفت. دەربەس؛ دەربەست؛ دەربەستە؛ دەربەسە؛ تایبەتی کەڵکوەرگری یان خاوەنیەتی تەنیا لە لایەن یەک کەس،

دەستە یان ڕێکخراوەوە ‹خانەی دربست: اتوبوس دربست: ماڵی دەربەس؛ ئوتووبووسی دەربەست›.

**دربست**[۲]: *قید.* دەربەست؛ دەربەس؛ بە تەواوی و بێ‌کەمایەسی؛ لەگەڵ هەموو کەلوپەلدا ‹همه چیز دربست در اختیار شماست: هەموو شتێ دەربەست لە خزمەتتانە›.

**دربسته** / darbaste/: *صفت.* سەربەسراو: ۱. ـ*ها*/ بە دەرگای داخراوەوە ‹صندوق دربسته: سندووقی سەربەسراو› ۲. هەڵنەتەکیاگ؛ تایبەتمەندی دەفر یان هەر شتێ کە درگاکەی نەکراوەتەوە.

**دربستی**[۱] / darbastî/: *صفت.[گفتاری]* دەربەس؛ دەربەسی؛ دەربەست ‹یک مینی‌بوس دربستی گرفته بودند: مینی‌بووسێکی دەربەسیان گرتبوو›.

**دربستی**[۲]: *قید.[گفتاری]* دەربەسی؛ بە دەربەستی؛ بە شێوەی دەربەست ‹ما را دربستی ببر بانه: دەربەستی بمانبەرە بانە›.

**دربند** / darband/: *اسم.* ۱. ـ*ها*/ دەربەن؛ کەرەسەیەک بۆ بەستنی دەرگا بە شێوەی خۆمەش، کە بە پشتی درگاوە دادەنرێ و بە یارمەتی فەنەر، چەرخدەندە و لۆسە کار دەکا ۲. *[قدیمی]* ئالوولە؛ دەربوونە؛ کۆلانی چکۆلە و ڕێ‌کوورک کە زۆرتر بە سەریەوە دەروازە هەبوو.

**دربوداغان** / darb-o-dāqān/: [عربی/ فارسی/ از ترکی] *صفت.[گفتاری]* ۱. شەق‌وشڕ؛ شنیار؛ ورد و خان؛ ورد و خاش؛ بە بەش یان لەتگەلی شکاو و لێک‌پساو بە هۆی لێکەوتن و داڕزاویەوە ‹با یک سواری دربوداغان خودمان را رساندیم به شهر: بە سەوارێکی شەق‌وشڕ خۆمان گەیاندەوە شار› ۲. *[مجازی]* شەل‌وپەت؛ شەکەت؛ زۆر ماندوو ‹دیروز که دیدمش دربوداغان بود: دوێنێ کە دیتم شەل‌وپەت بوو›.

**درپوش** / darpûš ، ـ*ها*/: *اسم.* دەرپۆش؛ دەرپۆشک؛ دەرخون؛ دەرخۆنە؛ دەرخوین؛ دەرخوینک؛ سەرپۆش؛ قەپاغ؛ قەباخ؛ قەپاخ؛ دەمەوانە؛ پەرەیێ کە دەرک یان کونێ دادەپۆشێ ‹درپوش چاه آب: دەرپۆشی چاڵاو›.

**درج** / darc/: [عربی]*اسم.[ادبی]* کار یان ڕەوتی نووسینی شتێ لە جێگایەک.

**درج** / dorc ، ـ*ها*/: [عربی]*اسم.[ادبی]* مجری؛ قوتوویەکی چکۆلە کە زۆرتر شتی بایەخداری تێدا هەڵدەگرن.

**درجا**[۱] / darcā/: *اسم.[نظامی]* لەجێ؛ دەرجا؛ پاکوتە؛ لە جێ خۆوە بە نەرمی هەنگاو نان؛ لەجێوە پێ‌هەڵێنان و بە زەویدادان.

▣ **درجا زدن**: *[کنایی]* لەجێوە کوتان؛ لە جێی خۆدا مانەوە؛ پێشڕەوت نەکردن ‹همه به جایی رسیدند، اما تو هنوز همان‌طور درجا می‌زنی: هەموو بە جێگایەک گەیشتن، بەڵام تۆ هەر لە جێوە دەکوتی›.

**درجا**[۲]: *قید.[گفتاری]* دەسبەجێ؛ دەزبەجێ؛ دەرجا؛ هەر لە جێ؛ بێ‌وێستان؛ بێ‌وێسان ‹درجا کشته شد: دەسبەجێ کوژرا›.

**درجات** / daracāt, darecāt/: [عربی] جمعِ ☜ **درجه**

**درجه** / darace, darece ، ـ*ها*؛ درجات/: [عربی] *اسم.* دەرەجە: ۱. *[ریاضی]* یەکەی ئەندازەگرتنی گۆشەکەوانی جەغزێک ‹با شیب ۱۰ درجه پایین می‌رفت: بە لێژی ۱۰ دەرەجەوە بەرەو خوار دەڕۆیشت› ۲. پلەک؛ یەکەی پێوانی دەما ‹امروز صبح هوا ۵ درجه زیر صفر بود: ئەم بەیانیە هەوا ۵ دەرەجە ژێری سیفر بوو› ۳. پلە؛ پلەک؛ پلەوپایە ‹درجەی سروانی: دەرەجەی سەروانی› ٤. پلە؛ پلەک؛ مەقان؛ هەرز؛ پلەوپایەی کەسێ یان شتێ لە ڕوانگەی چۆنیەتیەوە ‹کارشناس درجه یک؛ سینمای درجه دو: کارناسی دەرەجە یەک؛ سینەمای دەرەجە دوو› ۵. نمرە؛ پلە؛ ئەندازە ‹درجەی اعتبار: دەرەجەی هورم› ٦. *[گفتاری]* گەرماپێو (وەک گەرماپێوی بژیشکی) ‹درجه گذاشتم تب داشت: دەرەجەم دانا یاوی هەبوو›.

⊡ **درجه‌ی حرارت:** ده‌ما؛ گه‌رما یان سه‌رمای له‌ش یان ئاقاریک.

**درجه ــ درجه:** ١. پله‌ک ــ پله‌ک ٢. له قۆناغێکه‌وه تا قۆناغێکی‌تر.

**درجه‌ی دکترا/ دکتری:** پله‌ی دوکتوری؛ ناوێکی شانازیانه یان ده‌سکه‌وتنی بۆ که‌سانێ که پله‌یه‌کی دیاریکراو له خوێندنی بالایان تێپه‌ڕاندووه یان له‌و ئاسته‌دا تۆژینه‌وه و لێکۆڵینه‌وه‌یان هه‌بووه.

**درجه‌ی ذوب:** پله‌ی توانه‌وه؛ ئه‌و ئه‌ندازه له ده‌ما که ئه‌بێته هۆی توانه‌وه‌ی ماکێک.

**درجه‌ی ریشتر** ☜ **ریشتر**

**درجه‌ی سانتیگراد** ☜ **درجه‌ی صدبخشی**

**درجه‌ی سختی:** *[زمین‌شناسی]* ئه‌ندازه‌ی خۆڕاگری کانیێک له هه‌مبه‌ر ڕووشانه‌وه.

**درجه‌ی سلسیوس** ☜ **درجه‌ی صدبخشی**

**درجه‌ی صدبخشی:** پله‌کی نیشاندانی ده‌ما که به گوێره‌ی توانه‌وه‌ی یه‌خ تا کولانی ئاو، سه‌د به‌ش کراوه، سیفر پیشانده‌ری خالی به‌ستران و ١٠٠ پیشانده‌ری خالی هاتنه‌کولی ئاوه: **درجه‌ی سانتگراد؛ درجه‌ی سلسیوس**

**درجه‌ی عینک:** نمره‌ی چاویلکه.

**درجه‌ی فارنهایت:** پله‌کی فارنهایت؛ پله‌کی پێوانی ده‌ما، که خالی به‌سرانی ئاو ٣٢° ژوور سیفر، خالی کولانی ئاو ٢١٢° ژوور سیفر و خالی سیفره‌که‌شی بریتیه له ده‌مای تێکه‌لاوێکی به‌فر و خوێ له یه‌ک ئه‌ندازه‌دا.

⊡ **درجه دادن:** *[نظامی]* پله‌ک دان؛ پله‌ک پێدان؛ پله پێدان؛ پله‌ک دان له هێزی چه‌کداریدا.

**درجه گذاشتن:** ده‌رجه نان؛ دانانی گه‌رماپێوی پزیشکی له ژێر زمان یان هه‌نگلی که‌سێکه‌وه بۆ دیاری‌کردنی ده‌مای له‌ش.

**درجه گرفتن:** *[نظامی]* پله‌ک وه‌رگرتن؛ پله گرتن؛ گه‌یشتن به پله‌وپایه‌ی بانتر (له هێزی چه‌کداریدا) ‹امروز عده‌ای از ارتشیها درجه گرفتند: ئه‌مرۆ تاقمێ له ئه‌رته‌شیه‌کان پله‌کیان وه‌رگرت›.

**درجه‌بندی** / daracebandî, darece- ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پله‌به‌ندی؛ پله‌کبه‌نی؛ ده‌ره‌جه‌به‌ندی؛ ده‌ره‌جه‌به‌نی: ١. کار یا ڕه‌وتی دیاری‌کردنی ده‌ره‌جه‌ی چه‌ن شت له ده‌سته‌یه‌ک، له بواری چۆنیه‌تی، چه‌ندیه‌تی و ئه‌ندازه و ... دا ‹قرار است سینماها درجه‌بندی شوند: بڕیار وایه سینه‌ماکان پله‌به‌ندی بکرێن› ٣. دابه‌شینی که‌ره‌سه‌ی ئه‌ندازه‌گری به پله‌کگه‌لی وه‌ک‌یه‌ک به گوێره‌ی پێومانێکی ڕه‌چاوکراو ‹این خط‌کش بر حسب اینچ درجه‌بندی شده است: ئه‌م خه‌تکێشه به گوێره‌ی ئینچ پله‌به‌ندی کراوه›.

**درجه‌دار** / daracedār, darecedār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. ده‌ره‌جه‌دار؛ هه‌ر کام له ئه‌ندامانی هێزی چه‌کداری ئێران، له سه‌ر ده‌سته‌وه تا پێش ئه‌فسه‌ری (گرووبانی و ئوستواری).

**درحالی که** / darhālîke/: [فارسی/ عربی/ فارسی] ☜ **حال**

**درخت** / deraxt ، ـها؛ ـان/: اسم. دار؛ ده‌ره‌خت؛ درخت؛ درووشه؛ ڕوه‌کێکی هه‌میشه‌یی چێوی به کۆته‌ی لانی که‌م شه‌ش میتر به‌رزی و لق‌وپۆی چه‌ترئاسا له سه‌ریه‌وه.

⊡ **درخت آهن:** ئاسنه‌دار؛ ئاسندار؛ داره ئاسن؛ ته‌خته‌ی ئاسن؛ داری لیره‌واری زۆر پته‌و؛ ده‌ره‌ختێکه گوڵه‌که‌ی بچووک و زه‌رده، به‌ره‌که‌ی له بادام ئه‌چێ، هه‌ندێکی ئه‌خورێ یان ڕۆنی لێ ده‌گیرێ، ته‌خته‌که‌ی ڕه‌ق و زه‌ردی کاله، توێکله‌که‌شی ده‌رمانی لێ دروست ده‌بێ.

**درخت پیه/ دنبه:** دارپیو؛ ناوێ گشتی بۆ چه‌ن دار که چه‌وری گیاییان هه‌یه و له پیشه‌سازیدا به‌کارده‌چن: **پیه برنئو**

درخــــت ســـقز: وەن؛ وەنی؛ وەنـــا؛ داروەن؛ داربـــەن؛ دارکەســـکان؛ داری لاپالـــەکانی زاگرۆس بەتایبەت هەورامان کە بنێشتی لێ دەگرن.

درخت مراد: *[فرهنگ‌مردم]* داری ئاوات؛ دار مرای؛ داریَ کە برێک بە پیرۆزی دەزانن و بە بەســتنی پــەرۆ شــین پێیــەوە خوازیــاری بەدیهاتنی ئاواتەکەیانن.

درخــت نــان: دار نــان؛ داری نــان؛ دارەنــان؛ دارێکی جوان لە تیرەی توو، بوومی ئافریقایە، بە گەلای پان و برگە- برگەی ســەوز و بــەری خڕەوە کە لە برێ ناوچەی ئافریقادا نــانی لێ ئەکەن.

◘ درخت را انداختن: دار برینەوە؛ دار خــستن؛ دەرخــت خــستن؛ دارەوە دارنــای/ بریــەی؛ برینەوە یان شــکاندن و لــە بــەین بــردنی دار ‹درختهــای بــاغ را انداخــــ: دارەکــانی باخیــان بریەوە›.

درخت نشاندن: دارچاندن؛ دارنیان؛ داربنارتن؛ دار نیای؛ دار چەقنەی.

**درختچــــه** / deraxtče ، ـهــا/: *اســم.* داریچــــە؛ دارچــک؛ داریچــک؛ چــڵوو؛ دەوەن؛ بنچــک؛ دەرەختیلە؛ دەڤی؛ داڵیشەخەڵ؛ شخەڵ؛ دارێکی چکۆلە بــە بــەرزایی یــەک تــا پێــنج میتــر، کــە کۆتەیەکی ئەوتۆی نیە و هەر لە بنەوە لەق و پۆ دەکا.

**درختــــزی** / deraxtzî ، ـهــا؛ ـان/: *صـــفت.* *[زیست‌شناسی]* دارژی؛ بە تایبەتمەندی و توانــایی ژیان لە سەر دار و دەرەختەوە ‹کوالا جانور درختزی است: کوالا گیانەوەرێکی دارژیە›.

**درختستان** / deraxtestān ، ـها/: *اسم.* دارســتان؛ دارســان؛ لێــڕەوار؛ جەنگــەڵ؛ شــوێنی پــڕ دار و دەرەخت.

**درختکاری** / deraxtkārî ، ـها/: *اسم.* دارچــێنی؛ کار یان ڕەوتی دارنیان؛ نەمام ناشــتن؛ چانــدنی دار و دەوەن، بەتایبــەت لــە هــەژمارێکی زۆردا ‹دیروز بخشی از زمینهای بایر را درختکاری کردند: دوێنــێ بەشــێ لــە زەویگــەلی وشــکەیان دارچــێنی کرد›.

**درختـــــی** / deraxtî ، ـهـــا/: *صـــفت.* ۱. داری؛ دەرەخـــتی؛ درخـــتی؛ پێوەندیـــدار یـــان ســـەر بـــە دارەوە ‹سیب درختی: سێوی داری› ۲. دەرەختــدار؛ بــە دار ‹خیابــان درختــی: شــەقامی دەرەختــدار› ۳. دارئاسا؛ دەرەختئاسا (بــە شــێوەی لــق ــ لــق) ‹ساختار درختی: پێکهاتەی دارئاسا›.

**درخــــش** / deraxš/: *اســم.* برووســکە؛ بریقــە؛ بریسکە؛ بریکــە؛ بــریس؛ ترووســک؛ ترووســکە؛ دەرەوشە؛ دروشە؛ دەرەوش؛ ئەڵماســە؛ چــرووس؛ تابــشتی کــوتوپــڕی نــوور (وەک تیــشکدانەوەی فلاشی دووربینی وێنەهەڵگری).

**درخــــــشان** / deraxšān, daraxšān/: *صـــفت.* دەرەوشان؛ درۆشن: ۱. ڕۆشن؛ شەوقدار؛ خەڕرا؛ بریقــەدار؛ بــە بریقــە؛ تەیــسۆک؛ تەیــسان؛ ڕووناهیدەر؛ بە دەرەوشــین؛ وریــشن؛ گرشــەدار؛ ڕەخشان؛ بە تابــشتی نوورانیــەوە (وەک تــاو یــان چرای ڕۆشن) ‹آفتاب درخشان: هــەتاوی دەرەوشــان› ۲. بریقــەدەر؛ زەڕقــی؛ بــە ڕوویــەکی ســاف و بریقەدارەوە (وەک ئاوێنە و زێڕ) ‹در میان خاکها شئ درخشانی به چشم می‌خورد: لــە نــاو خــاکوخۆڵــدا شتێکی دەرەوشان دیار بــوو› ۳. *[مجازی]* بــەرچاو؛ زەق؛ شیاوی سەرنج و زۆر بەرچاو ‹کار درخــشان: کــاری دەرەوشــان›. هــەروەها: **درخــشان بــودن؛ درخشان شدن؛ درخشان کردن**

**درخـــشش** / deraxšeš, daraxšeš ، ـهــا/: *اسم.* ۱. دەرەوشـــە؛ برووســـکە؛ بـــریس؛ بریـــسکە؛ چروسکە؛ تروسکە؛ ترووسک؛ تێسکە؛ تیسکە؛ وریشە؛ ورشە؛ ورشە؛ گرشە؛ زیوە؛ بریقە؛ ورچــە؛ بەرق؛ زەڕق؛ کەل؛ بەلــەدی؛ مــەرێس؛ لــەیلان؛ تەیس؛ چۆنیەتی دەرەوشانەوە ‹درخشش خورشید: دەرەوشەی خۆر› ۲. *[مجازی]* دەرەوشانەوە؛ کار یان

ڕەوتی هەڵدان، بەدەست هێنانی ناوبانگ و خۆشەویستی ‹کردستان در زمینەی تولید گندم درخشش داشته است: کوردستان لە بەرهەمهێنانی گەنمدا درەوشاوەتەوە›.

**درخشندگی** / deraxšandegî, daraxšandegî ، ـها/: *اسم.* تەیسۆکی؛ گرشەداری؛ بریقەداری؛ دۆخ یان چۆنیەتی درەوشان بوون ‹از میزان درخشندگی آن کاسته نشده بود: لە ڕادەی بریقەداریەکەی کەم نەبووەوە›.

**درخشنده** / deraxšande, daraxšande/: *صفت. [گفتاری]* تەیسۆک؛ ورشەدار؛ وریشەدار؛ گرشەدار؛ شەوقدار؛ خەڕرا؛ بریقەدار؛ بە بریقە؛ تەیسان؛ ڕووناهیدەر؛ درۆشن؛ وریشن؛ ڕەخشان؛ بە درەوشین ‹یک چیز درخشنده بە چشمم خورد: شتێکی تەیسۆک کەوتە بەر چاوم›.

**درخشیدن** / deraxšîdan/: *مصدر. لازم.* //**درخشیدی:** درەوشایەوە؛ **میدرخشی:** دەدرەوشیەوە؛ **بدرخش:** بدرەوشەوە// درەوشانەوە؛ درەوشیانەوە؛ درەوشان؛ درەوشینەوە؛ درەوشین؛ درەخشیان؛ درەخشانەوە؛ درەخشینەوە؛ زەرقین: ۱. ترووسکانەوە؛ ترووسکیانەوە؛ برووسکانەوە؛ تەیسین؛ ورشەدان؛ زەریقین؛ ئەوەدرۆشیەی؛ درۆشیایوە ‹چراغهای شهر از دور میدرخشیدند: چراکانی شار لە دوورەوە دەدرەوشانەوە› ۲. بریقانەوە؛ بریقە دانەوە؛ شەوق دانەوە؛ ورچەوە دەی؛ نوور هەڵگەڕاندنەوە ‹چشمش در تاریکی میدرخشید: چاوی لە تاریکیدا دەدرەوشایەوە› ۳. *[مجازی]* کارێکی بەرچاوکردن ‹آزاد در مدرسه خوب درخشید: ئازاد لە قوتابخانەدا باش درەوشایەوە›. هەروەها: **درخشیدنی**

■ صفت فاعلی: **درخشنده** (درەوشەر)/ صفت مفعولی: **درخشیده** (درەوشاو)/ مصدر منفی: **نَدرخشیدن** (نەدرەوشانەوە)

**درخواست** / darxāst ، ـها/: *اسم.* داخواز: ۱. داخوازی؛ داوا؛ داواکاری؛ کاری خواستنی شتێک ‹هرچه لازم داری از اداره درخواست کن: هەرچێکت دەوێ لە مەزرینگە داواکە› ۲. داخوازنامە؛ خوازنامە؛ خواستنامە ‹یک درخواست بنویس بده به منشی: داخوازێک بنووسە و بیدە بە نووسیارەکە› ۳. داوا؛ ئەوی کە خوازراوە ‹کارگران خواهان رسیدگی بە درخواستشان شدند: کرێکارەکان خوازیاری ڕاگەیشتن بە داخوازەکەیان بوون›. هەروەها: **درخواست داشتن؛ درخواست شدن؛ درخواست کردن**

**درخواستنامه** / darxāstnāme ، ـها/: *اسم.* داخوازنامە؛ داوانامە؛ لاپەڕەیەکی چاپی بە کۆمەڵە داواکاریەکی کاڵا یان ڕاژە، لە دامەزراوەیەک.

**درخواستی** / darxāstî ، ـها/: *صفت.* داواکراو؛ خوازراو؛ داخوازی ‹کتابهای درخواستی فرستاده شد: کتێبگەلی داواکراو ناردرا›.

**درخور** / darxor/: *صفت.* گونجاو؛ شیاو؛ دەرخۆر؛ دردەوەر؛ لەبار؛ لەباو، هاوسەنگ یان هاوڕێژە لەگەڵ شتێکدا.

**درد**[1] / dard ، ـها/: *اسم.* دەرد؛ دەردە: ۱. ئێش؛ ژان؛ ئالنگ؛ گزیرک؛ هەستی ناخۆش و گەهرێنەر کە بە هۆی گەزن یان نەخۆشیەوە بەدی دێ ‹درد پشت؛ درد استخوان: ئێشی پشت؛ دەردی ئێسک› ۲. *[مجازی]* ژان؛ ژانژوور؛ ژانوژوور؛ ژانەهوویرک؛ پرک؛ بەرەژان؛ زاجلانەی؛ گوشار و ناڕەحەتیەک کە ژن لە کاتی زایینەدا هەستی دەکا ‹نیمەشب دردش شروع شد: نیوەشەو ژانی دەستی پێکرد› ۳. *[مجازی]* کەسەر؛ خەم؛ خەفەت؛ کوڵ؛ جخار ‹درد غربت؛ درد بیمادری: دەردی غەریبی؛ دەردی بێدایکی› ٤. *[مجازی]* گرفت و دەردیسەری ‹کسی نیست تا آدم درد خودش را به او بگوید: کەسێ نیە بنیادەم دەردی خۆی پێ بڵێ›.

▣ **درد بیدرمان:** *[کنایی]* دەردی بێدەرمان؛ دەرد کاری؛ دەردگرۆ؛ دەردێ کە چاری

نـاكرێ ‹حماقـت درد بـی‌درمـانی اسـت: گـەوجی دەردێكی بێ‌دەرمانە›.

▣ درد آمدن: ئێش هاتن؛ هاتنە ئێش؛ ئێـشان؛ یێشان؛ ئێشەی؛ ئێشای؛ تووشی ئـێش هـاتن ‹طـوری زد كـه دردم آمـد: جـۆرێ لێیـدام ئێشی هات›: به درد آمدن

درد آوردن: ئێشاندن؛ یێـشاندن؛ شـەبكاندن؛ هاوردنـە ئـێش؛ تووشـی ئـێش‌كـردن؛ ئـێش هێنان؛ ئێشنەی؛ ئێشنای ‹این آمپولها خیلـی درد می‌آورند: ئەم دەرزیانە زۆر دێشێنن›.

درد داشـــتن: دەرد هـــەبوون: ١. [مجـــازی] دەردمەند بوون ‹چه دردی داری؟ دردت چیست؟: چ دەردێكت هەیـە؟ دەردت چیـە؟› ٢. ئـێش هەبوون؛ بەژان بوون؛ بـە ئـازار بـوون ‹دنـدانم چـرک كـرده بـود خیلـی درد داشـت: ددانم چـڵكی كردبوو ئێشی زۆر بوو›.

درد كردن: ئێشان؛ ئێشیان؛ ئێشەی؛ ئێـشای؛ ئـێش‌كـردن؛ شـەبكین؛ ژان‌كـردن؛ هەسـتی ناخۆش و بە ئازاركردن ‹سرم درد می‌كرد: سـەرم دیشا›.

درد كـشیدن: ئـێش‌كێـشان؛ دەردكێـشان؛ تووشی ئێش بوون ‹تا پایم خوب شـد، دو مـاه درد كسیدم: هەتا پـام چـاک بـۆوە، دوو مانـگ ئێشم كیشا›.

درد گـرفتن: هاتنـە ئـێش؛ ئێـشان؛ ئێـشیان؛ ئێـشەی؛ ئێـشای؛ ژانـین؛ ژان‌كـردن؛ ژان كەردش؛ ئێش‌كردن؛ تووشی ئێش بوون ‹سرم درد گرفت: سەرم هاتە ئێش›.

دردی را دوا كـردن: [كنـایی] دەردێـک دەوا كـردن؛ (بـە) دەرد خـواردن؛ دەرد واردەی؛ كارامە بوون ‹این حرفها دردی را دوا نمی‌كند: ئـەو قسانە دەردێک دەوا ناكەن›.

به درد آمدن ☜ درد آمدن

به درد خوردن: [مجازی] بە كەڵک هـاتن؛ بـە كـار هـاتن؛ بـە دەرد خـواردن؛ دەرد واردەی ‹پول، این روزها به درد می‌خورد: پارە، ئەم ڕۆژانە بە كەڵک دێ›. هەروەها: به درد نخوردن

ـ درد [2]: پیوازه. ـ ئێشە؛ ـ یێشە؛ نیـشانەی بـوونی ئێش لە بەشێ لە لەشدا ‹سردرد؛ پادرد: سەرئێـشە؛ پانیشە›.

درد / dord /: اسم. تـڵتە؛ پـڵتە؛ تـڵفە؛ تـڵفارە؛ خلتە؛ سـەركۆزەر؛ چـەولۆک؛ خـەوش و مـاكی ناتێكەڵ لە تراوێكدا كە لە بنیدا ماوەتەوە.

دردآشنا / dardāš(e)nā ، ـها؛ ـیان /: صفت. [ادبی] دەردزان؛ دەردەزان؛ دەردئاشنا؛ خاوەن ئاگـایی لە خەم و مەینـەتی خەڵـكیتـر و ئاشـنایی بـە دەردی دیتران ‹درد خود را باید بـه دردآشـنا گفـت: دەردی خۆ ئەبێ بە دەردزان بێژی›.

دردآشنایی / dardāš(e)nāyî /: اسم. دەردزانی؛ دەردەزانی؛ دەردئاشـنایی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی دەردزان بوون.

دردآلـود / dardālûd /: صفت. بـەژان؛ ژانـدار؛ ژاناوی؛ بە ئێش؛ تێكەڵ لەگەڵ ئێشدا.

دردآور / dardāvar /: صفت. ژانهـێن؛ ژانـدەر؛ ئێـشێنەر؛ دەردپـێدەر؛ ئـێش پـێ‌گـەیێن؛ بەدیهێنەر و هۆی ئێش.

دردا / dardā /: صـوت. [ادبـی] داخـم؛ پـەكوو؛ حەیف؛ بەداخەوە؛ مخابن؛ ئاخ؛ دەردۆ؛ ئاخ؛ ئای؛ تەمتەقۆ؛ ئەک؛ ئەک ودەک؛ حـەیفێ؛ حـەیف و خەسار؛ وشەیەک بۆ دەربڕینی ناكامی و لەكیس دانی شتێک ‹دردا كه راز پنهان خواهـد شـد آشـكارا: داخم ڕازی نهێنی دەردەكەوێ سەرەنجام›.

دردار / dardār ، ـها /: صفت. سـەردار؛ درگـادار؛ دەردار ‹شیـشەی دردار؛ قـوطی دردار: شووشـەی دەردار؛ قوتووی سەردار›.

دردانه / dordāne ، ـهـا /: صفت. [مجازی] نـازدار؛ نازار؛ ئاوەختی؛ زۆر خۆشەویـست ‹عزیـز دردانـە: ئازیزی نازدار›.

درددل / dardedel ، ـهـــا /: اسم. [مجـــازی] دەردەدڵ؛ دەردیدڵ؛ كاز_كاز؛ لەجە؛ گلـەیی و

کوڵ و کەسەرێک کە کەسێ پێی خۆشە لە لای دۆستێکەوە بیدرکێنێ.

▣ **درد دل کردن/ گفتن:** *[مجازی]* دەردیدڵ کردن؛ کاز‌کازکردن؛ دەردەدڵ کەردەی؛ خەفەت و ڕازی خۆ لای کەسێ گوتن ‹آمده بود با من درددل کند: هاتبوو لەگەڵما دەردیدڵ بکا›.

**به درد دل کسی رسیدن:** *[مجازی]* گوێدان بە ناڵەی کەسێک؛ بە دەرد و گرفتی کەسێ گوێدان و لەگەڵیدا هاودەردی کردن و یارمەتی دانی ‹آخر یک دقیقه هم به درد دل من برس: سا دەمێکیش بە ناڵەی من گوێ بدە›.

**دردسر** / dardesar ، ـها/: *اسم.* دەردیسەر؛ دەردەسەر؛ زەحمەت؛ ئاشێ؛ خەرخەشە؛ دەرد و کوێرەوەری ‹به خاطر آن اعتصاب، رییس دانشکده دچار دردسر شد: لە بەر ئەو مانگرتنە، سەرۆکی زانکۆ تووشی دەردیسەر بوو›.

▣ **دردسر دادن:** *[کنایی]* سەر ئێشاندن؛ دەردیسەر دان؛ سەرە ئاردەیوە قوڵێ؛ چەنەوێژی‌کردن و سەر هێنانە جۆش ‹ببخشید که این‌قدر شما را دردسر دادم: ببوورن ئەوندە سەرم ئێشاندن›.

**به دردسر انداختن:** خستنە زەحمەتەوە؛ خستنە دەردیسەر؛ هۆی زەحمەت و گرفتاری بوون.

**دردسنج** / dardsanc ، ـها/: *اسم.* ئێش‌پێو؛ ئامرازێک بۆ پێوانی چکۆلەترین گوشارێ کە دەبێتە هۆی بەدیهاتنی ئێش.

**دردکش** / dardkeš/: *صفت.* دەردکێش؛ ئێش‌کێش؛ تووشیاری ئێش و ناچار بە کێشانی.

**دردکش** / dardkoš/: *صفت.* ئێش‌بڕ؛ دەردبڕ؛ ژانبڕ؛ ژانبەر؛ بە تایبەتمەندی لە ناو بردنی ئێشەوە.

**دردم** / dardam/: *قید.* دەسبەجێ؛ دەزبەجێ؛ یەکجێ؛ یەکجا؛ هەر چانە؛ دەستوبرد؛ هەر لەجێ؛ بێ‌درەنگ؛ یەکەو جار؛ نهۆ؛ نهووکە؛ هەر دەوکاتەدا ‹دردم کشته شد: دەسبەجێ کوژرا›.

**دردمند** / dardmand ، ـان/: *صفت.* دەردمەن؛ دەردمەند؛ دەردکێش؛ دەردەدار؛ دەرددار: ١. *[نامتداول]* نەخۆش؛ بەئازار؛ دەرداوی؛ لەش‌بەبار ٢. *[مجازی]* زوێر؛ زوێن؛ خەمگین؛ خەفەتبار؛ دڵتەنگ ‹مادر دردمند؛ دل دردمند: دایکی دەردمەن؛ دڵی دەردمەند›.

**دردمندی** / dardmandî/: *اسم.* دەردەداری؛ دەرداری؛ دەردمەندی؛ کەزڵاتەی؛ خەمگینی؛ خەفەتباری؛ دڵتەنگی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خەفەتبار بوون.

**دردناک** / dardnāk/: *صفت.* بەژان؛ بەئازار؛ لەژان: ١. هۆی دەرد و ئێش ٢. دەرددار؛ دەردمەن؛ بە ئێش و دەرد ‹اندام دردناک: ئەندامی بەئازار›.

**دردو** / derdo:, derdow ، ـها/: *صفت.* *[گفتاری، تعریض]* زمانباز؛ بە دەم و پل؛ زیرەک و قسەزان.

**دررفت** / dar.raft/: *اسم.* دەرچوو: ١. *[گفتاری]* هەزینە؛ خەرج‌وبەرج ٢. *[مجازی]* ئەوەی بەکار دەچێ یان خەرج دەبێ.

**دررفتگی** / dar.raftegî ، ـها/: *اسم.* لە جێ/ گە چوویی؛ چرت؛ دەرچوویی؛ جودایی نەخوازراوی ئالقە یان بەشێ لە کۆمایێ ‹دررفتگی مفصل: لە جێ چوویی جمگە›.

**دررفتن** / dar.raftan/: *مصدر. لازم.* // **دررفتی:** دەرچووی؛ **درمی‌روی:** دەردەچی؛ **دربرو:** دەرچۆ// دەرچوون؛ دەرپەڕین؛ بەرشیەی: ١. خۆ ڕاپسکان؛ چرتیان؛ ڕاکردن؛ هەڵاتن؛ لە بەر دەستی کەسێکدا بەر بوون ‹تا سرم را برگرداندم دستش را کشید و دررفت: تا لامکردەوە کشاوە و دەرچوو› ٢. فەرقڕین؛ پەکین؛ خەلیان؛ ترازان؛ ترازیەی؛ ترازیای؛ لە جێی خۆوە دەرهاتنی شتێک بە هۆی گوشار یان هێزی ناوەکیەوە

‹دررفتن استخوان؛ دررفتن تیر: دەربەرینی ئێسک؛ دەرچوونی تیر›. هەروەها: **دررفتنی**

■ صفت مفعولی: **دررفته** (دەرچووگ)/ مصدر منفی: **درنَرفتن** (دەرنەچوون)

**دررو** / dar.row ، ـها/:اسم. *[گفتاری]* دەربازگە؛ دەرەتان؛ دەرو؛ ڕێی دەرچوون ‹رفت توی کوچەای که دررو نداشت و گیر پاسبانها افتاد: چووە نێو کۆلانێکەوە دەربازگەی نەبوو، کەوتە گیر پاسەوانەکانەوە›.

**درز** / darz ، ـها/:اسم. درز؛ دەرز: ١. چاک؛ تلیش؛ جێگای پێوەندی یان دروومانی دوو لەت لە شتێک ‹درز کتت شکافته شده است: درزی کۆتەکەت باز بووە› ٢. *[پزشکی/ الف]* لکانگەی ئێسکەکانی کاپۆل پێکەوە؛ جێگەی چەسپانی ئێسکگەلی سەر بە یەکەوە ب) تەقەڵ؛ تەقەلە؛ بەخیەی برینگاری ٣. قەڵش؛ قڵیش؛ قەڵەش؛ قەڵەشت؛ تلیش؛ شەق؛ شڕەق؛ ترەک؛ ترەکە؛ تریشکە؛ کەلێن؛ تریک؛ چاک ‹از درز در نگاه کن: لە درزی درگاکەوە بڕوانە›.

▣ **درز کردن**: دزەکردن؛ بڵاو بوونەوە: ١. لە درزی شتێکەوە چوونە دەر ‹نور از شکاف در درز می‌کرد: تیشک لە درزی درگاوە دزەی دەکرد› ٢. *[مجازی]* درکان؛ درکیای؛ کەوتنە دەرەوەی ڕازێک.

**درز گرفتن**: ١. درزگرتن؛ کەلێن‌گرتن؛ تەقەڵ دان؛ دوورانی دوو تیکە پارچە بە یەکترەوە ٢. *[مجازی]* قسە کورت‌کردنەوە؛ کۆتا کردنەوەی باس ‹فوراً حرفم را درز گرفتم و بیرون آمدم: دەسبەجێ قسەم کورت کردەوە و وەدەرکەوتم›.

**درزگیری** / darzgîrî/:اسم. درزگری؛ کار یان ڕەوتی درز دادان؛ دووران یان داپۆشاندنی درزی شتێ (وەک جلوبەرگ، دیوار و...).

**درز و دوز** / darz-o-dûz/:اسم. *[گفتاری]* دڕاوی جلوبەرگ کە پێویستی بە دوورین و پینەکردن هەیە.

**درزه** / darze ، ـها/:اسم. ١. *[قدیمی]* تایە؛ گیشە؛ گرشە؛ قرشە؛ دەرزە؛ کوایەک لە هەر شتێ ٢. درزی چکۆلە.

**درزی** / darzî ، ـان/:اسم. *[قدیمی]* خەیات؛ جلدوور؛ بەرگدوور؛ شوونک؛ درووماندکار.

**درس** / dars ، ـها؛ دروس/: [عربی]/اسم. وانە؛ دەرز؛ دەرس: ١. ئەوەی کە بە هۆی خوێندن و ئەزموونەوە فێری دەبن ‹درس پزشکی: وانەی بژیشکی› ٢. نووسراوە یان ئاگاداری بۆ فێر بوون ‹درس خواندن؛ درس دادن: وانە خوێندن؛ وانە گوتنەوە› ٣. *[مجازی]* ئەزموون؛ پەند ‹تاریخ برای ما درس خوبی است: مێژوو بۆ مە ئەزموونێکی چاکە›.

▣ **درس انشا**: وانەی شێوە و چەشنی نووسین.

**درس عبرت**: *[مجازی]* پەند؛ پەن؛ پەنگ؛ ڕووداوێ کە ئامۆژگاری لێ وەردەگرن.

▣ **درس پرسیدن**: وانە پرسینەوە؛ لێ‌پرسینەوە؛ پرسینەوە لە قوتابی لەمەڕ ئەوەی فێری بووە.

**درس پس دادن**: وتنەوەی ئەو وانەیە فێری بووە.

**درس حاضر کردن**: وانە لە بەرکردن؛ دەرس ئامادەکردن ‹درسم را به خوبی حاضر کردەام: وانەکەم بە باشی لە بەرکردووە›.

**درس خواندن**: دەرس خوێندن؛ وانە خوێندن؛ دەرس وانەی: ١. خوێندنەوەی نووسراوەیەکی دەرسی ‹درس امروز را بخوان: دەرسی ئەمرۆ وەخوێنە› ٢. دەرز دادان؛ خۆنین؛ وەنەی؛ وانای؛ وەندایەنە؛ وەندەی؛ وەندش؛ دەرس فێر بوون ‹در مدرسەی ما درس می‌خواند: لە قوتابخانەکەی ئێمەدا دەخوێنێ›.

**درس خود را از بر/ فوت آب بودن**: *[مجازی]* ١. وەکوو ئاو لەبەر بوون؛ وەک ئاو ڕەوان بوون؛ وەربیەی ٢. *[کنایی]* دەرس خۆ چاک لە بەر بوون؛ کاری خۆ چاک زانین؛ ئاگادار بوون لە چۆناوچۆن جێبەجێ کردنی کارێ کە پێ

سپێراوە ‹مطمئن باش! من درس خودم را از برم: دڵنیا بە! ئەمن دەرس خومم چاک لە بەرە›.

**درس خود را بلد/ روان بودن:** دەرسی خۆ زانین؛ وانەی خۆ زانین.

**درس دادن/ گفتن:** وانە دان؛ دەرس دان؛ وانە وتنەوە؛ شتێک بە مەبەستی فێرکردن بە دیتران گوتن ‹امروز معلم چهار صفحه درس داد: ئەورۆ مامۆستاکەمان چوار لاپەڕە دەرسی دا›.

**درس گرفتن:** فێر بوون؛ هەڤۆتن: ۱. وانە فێر بوون؛ هین بوون؛ مسەی؛ ئاگایی لە مامۆستا وەرگرتن ۲. *[مجازی]* پەند وەرگرتن؛ شتێ لە ڕووداو یان تاقی‌کردنەوەیەک فێر بوون ‹از این حادثه درس خوبی گرفت: لەم ڕووداوە پەندێکی باشی وەرگرت›.

**درس‌افزار** / darsafzār ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. هەر کام لە ئامێرگەلی فێرکاری (وەک کتێب، شریت؛ یان وێنە و...).

**درست**[1] / dorost ، ـها/: *صفت.* دروست؛ درووس؛ دروس؛ درۆس؛ درس: ۱. بێ‌هەڵە یان نادروستی ‹حرف درست؛ کار درست: قسەی دروست؛ کاری درووس› ۲. بێ‌کەم و کووڕی یان شکاوی ‹ساعت درست شد: سەعاتەکە دروست بۆوە› ۳. پاک؛ ڕێک؛ ساق؛ تەواو؛ بێ‌کەمایەسی؛ موک ‹صد صفحه درست؛ چهل سال درست: سەد لاپەڕەی تەواو؛ ڕێک چل ساڵ› ٤. *[گفتاری]* ڕاست؛ ڕاس؛ چاک؛ باش ‹آدم درست: مرۆی دروست›.

▣ **درست بودن:** دروست بوون؛ درووس بوون: ۱. هەڵە نەبوون ۲. پاک و بێ‌خەوش بوون؛ بێ‌کەمایەسی بوون ۳. درووسکار بوون.

**درست شدن:** ۱. دروست بوون؛ درووس بوون ۲. چاک بوونەوە؛ دروست بوونەوە؛ دروست کران؛ وەش‌کریەی ۳. ئامادە بوون؛ تەیار بوون. هەروەها: **درست کردن**

**درست**[2]: *قید.* ڕاست؛ درووس؛ دروست: ۱. ڕاس؛ ڕێک ‹قطار درست سر ساعت آمد: قەتارەکە ڕاست لە سەر کاتی خۆی هات› ۲. بە دروستی؛ بە درووسی ‹آزاد درست همان کاری را کرد که گفته بود: ئازاد دروست هەر ئەو کارەی کرد کە گوتبووی›.

**درست‌آیین** / dorostāyîn ، ـها/: *صفت.* *[ادبی]* ۱. پەیڕەوی ئایینی دروست ۲. پەیڕەو و وەفادار بە ئایینێک.

**درستدین** / dorostdîn/: *صفت.* ۱. بڕواپتەو؛ خاوەن خوو و هۆگر بە پەیڕەوی تەواو لە فەرمانگەلی دینی ۲. ئۆرتودوکس.

**درستکار** / dorostkār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* ئاز؛ درووسکار؛ کاردرووس؛ درووسکار؛ ڕاستکار؛ ئاڤدەست؛ دەسپاک؛ بەختەوار؛ ڕاست و دروست؛ بێ‌فڕ و فێڵ؛ مرۆی بێ‌لاری و خواری و بێ‌گزی و فزی ‹کارگر درستکار: کرێکاری درووسکار›.

**درستکارانه**[1] / dorostkārāne/: *صفت.* درووسکارانە؛ دروستکارانە؛ دروستانە ‹رفتار درستکارانە: ئاکاری درووسکارانە›.

**درستکارانه**[2]: *قید.* درووسکارانە؛ دروستکارانە؛ بە درووسکاریەوە؛ لەگەڵ دروستکاریدا ‹درستکارانه رفتار می‌کرد: درووسکارانە دەجووڵاوە›.

**درستکاری** / dorostkārî/: *اسم.* درووسکاری؛ کاردرووسی؛ دروستکاری؛ سەرڕاستی؛ ئاکاری ڕاست و دروست و بە دوور لە خەیانەت و بێ‌گزی و فزی.

**درست وحسابی**[1] / dorost-o-hesābî/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ڕاست‌وپاک؛ ڕێک‌وپێک؛ سەرڕاست؛ ڕاست‌ودروست؛ بە چۆنیەتی، چەندیەتی، یان بارێکی شیاوەوە ‹آدم درست و حسابی؛ کار درست و حسابی: مرۆی ڕاست و پاک؛ کاری ڕێک‌وپێک›.

**درست‌وحسابی**[2]: *قید.* باش؛ بە باشی؛ بە ڕێک‌وپێکی؛ ڕاست و پاک؛ چاک؛ بە جوانی؛ بە خاسی ‹درست و حسابی در آنجا مستقر شده بود: باش دەوێدا سەقامگیر ببوو›.

**درسته**[1] / doroste/: *صفت.* *[گفتاری]* ساق:

۱. دەس‌نەخواردوو ۲. تەواو؛ تواو ‹یک نان درسته را خورد: نانێکی ساقی خوارد›.

**درسته**[۲]: *قید.* ساق؛ بە ساقی؛ بە یەکجاری ‹زردالو را درسته قورت داد: قەیسیەکەی بە ساقی قووتدا›.

**درستی** / dorostî/: *اسم.* دروستی؛ درووسی؛ ڕاستی؛ ڕاسی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی دروست بوون ‹درستی کارش معلوم نیست: دروستی کارەکەی دیار نیە› ۲. دروستکاری ‹درستی او در میان بازار معروف است: درووسی ئەو لە بازاڕدا بەناوبانگە›.

**درسخوان** / darsxān ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دەرسخوێن؛ دەرزوان؛ خاوەن هۆگریەتی بە دەرس خوێندن و فێربوونی ‹بچەی درسخوان: منداڵی دەرسخوێن›.

**درسنامه** / darsnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* وانە: ۱. کتێبی دەرسی، بەتایبەت لە بوارێکی وانەیی زانستگاییدا ‹درسنامەی روان‌شناسی: وانەی ڕەوان‌ناسی› ۲. هەر چەشنە نامیلکە یان وتارێک کە بۆ ئەو مەبەستە بە کار دەڕوا ‹بیشتر درسنامەها ترجمەی ناقص و نامفهوم کتابهای خارجی است: زۆرتری وانەکان پاچڤەی نیمە ناتەواو لە کتێبگەلی بیانین›.

**درس ومشق** / dars-o-mašq/: [عربی] *اسم.* وانە و مەشق؛ خوێندن و تەکلیفی وانەیی ‹بە درس و مشق بچەها رسیدگی می‌کرد: بە وانە و مەشقی منداڵان ڕادەگەیشت›.

**درسی** / darsî/: [عربی] *صفت.* وانەیی؛ دەرسی؛ دەرزی؛ پێوەندیدار یان سەر بە وانەوە ‹کتاب درسی؛ فعالیت درسی: کتێبی وانەیی؛ چالاکی دەرسی›.

**درشت** / dorošt/: *صفت.* ۱. /ـها/ گەورە؛ زل؛ زەلام؛ گرس؛ گر؛ گەپ؛ گورپە؛ ئەستوور؛ بە ئەندازە و هەندی گەورەترەوە ‹سیب درشت؛ تخم‌مرغ درشت: سێوی گەورە؛ هێلکەی زل› ۲. /ـها/ درشت؛ دشت؛ دوشتە؛ دووشتە؛ گرد؛ زروە؛ بە بایەخی زۆرەوە (بۆ پارە) ‹پول درشت: پارەی درشت› ۳. *[ادبی]* نەپۆڕ؛ ئاژ؛ ناساف؛ نارێک ‹جامەی درشت: بەرگی نەپۆڕ› ٤. *[مجازی]* ناشیرین؛ قەڵپ؛ ناخۆش؛ ناخوەش؛ دشت؛ ناڵەبار و تێکەڵ بە قین و ڕکەوە ‹حرف درشت: قسەی ناشیرین›.

▣ **درشت بار کسی کردن**: *[مجازی]* بە کەسێ کردن؛ قسەی سووک لە پارەسەنگی کەسێک نان؛ زیپک لە کەسێک دان؛ سەرکۆنە/ لۆمەی کەسێ کردن؛ قسەی ناخۆش و تێکەڵ بە لۆمەوە بە کەسێک گوتن ‹امروز صاحبخانه خیلی درشت بارم کرد: خاوەن ماڵ ئەوڕۆ زۆری پێ کردم›.

**درشتباف** / doroštbāf/ ☜ **درشتبافت**

**درشتبافت** / doroštbāft/: *صفت.* دووشتەچن؛ دوشتەچن؛ درشتچن؛ بە تان و پۆگەلێکی ئەستوور و لێک‌دوورەوە ‹فرش درشتبافت: فەرشی دروشتەچن›؛ **درشتباف** *[گفتاری]*

**درشتخو** / doroštxû ، ـها؛ ـیان/: *صفت.* *[مجازی، ادبی]* توندخوو؛ تونەخوو؛ تونەمەزاج؛ تنەخوو؛ توند و تیژ؛ خاوەن خووخدەی تون و تیژ و ئاکاری ناشیرین لەگەڵ خەڵکدا. هەروەها: **درشتخویی**

**درشتخوار** / doroštxār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* *[زیست‌شناسی]* نامۆخۆر؛ سیللوولی بێگانەخۆر کە لە پێکهاتن و سازانەوەی شانەگەلی مۆرەدارانـدا دەوری گرینگی هەیە: **کلانخوار**

**درشتنی** / doroštney ، ـها/: *اسم.* دروشە؛ لوولاک؛ لوولاق؛ بەلەک؛ گاللۆر؛ قەڵەمە؛ قولمە؛ هێسکە گەورەی پا کە بە زرانی و قولەپەوە بەند دەبێ.

**درشتی** / doroštî/: *اسم.* ۱. زلی؛ گەورەیی؛ درشتی؛ گردی؛ دۆخ و چۆنیەتی درشت بوون ۲. *[مجازی]* توند و تیژی؛ ئاکاری بە تووڕەیی و بێ‌ئارامی و سازشت ‹خیلی با مادرش درشتی می‌کرد: زۆر لەگەڵ دایکیدا توندوتیژی دەکرد›.

**درشکه** / doroške, dorošge ، ـها: [روسی]/اسم. پێتوون؛ فایتون؛ کالیسکه؛ عارەبانەی سواری سەرداپۆشراو کە دوو یان چەند ئەسپ دەیکێشن و مسافری پێ جێبەجێ دەکەن.

**درشکه‌چی** / doroškečî, dorošgečî ، ـها؛ ـان/: [روسی/ ترکی]/اسم. فایتونچی؛ کالیسکەچی؛ ئاژوێنی عارەبانە.

**درصد**[1] / darsad ، ـها/:اسم. لە سەد؛ سەدیچن؛ یەک یان چەند بەش لە شتێک کە بە سەد بەشەوە دابەش بووە ‹چند درصدی از این پول به تو می‌رسد: چەند لە سەدی ئەم پارەیە بە تۆ دەگا›.

**درصد**[2]: قید. سەتا؛ لە سەد، بە شێوازی بەش یان بەشگەلێک لە شتێک (بەتایبەت پارە) کە بە سەد دابەش کراوە ‹ده درصد تخفیف دارد: سەتا دەی داشکاوە›.

**درصدگیری** / darsadgîrî ، ـها/:اسم. کار یان ڕەوتی لە سەد گرتنی ژمارە یان چەندیەتیەک.

**درصورتی‌که** / darsûratîke /: [فارسی/ عربی/ فارسی] ☜ **صورت**

**درضمن** / darzemn /: [فارسی/ عربی] قید. هەروەها؛ هەرپاسە؛ وێڕای ئەمە؛ وێڕای ئەوە: ۱. هەر لەو کاتەدا؛ لە هەمان کاتدا ‹در ضمن پول هم لازم است: هەروەها پارەیش پێویستە› ۲. تازە؛ زیاتر لەوە؛ لەو بەدوا ‹در ضمن پولمان هم تمام شده است: هەروەها پارەیشمان تەواو بووە›: **ضمناً**

**درفش** / derafš, darafš ، ـها/:اسم. ۱. *[ادبی]* ئاڵا؛ دروشم؛ بەندێر؛ بەیاخ؛ بەیداخ ۲. درەوش؛ درەوشە؛ درێشک؛ درێشک؛ درێشە؛ درێشە؛ ئامێرێک بە نووکی تیژەوە بۆ کون کردن و دوورانەوەی چەرم.

**درفشانی** / dorfešānî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *[تعریض]* وتاربێژی: **درافشانی**

**درک** / darak /: [عربی]/اسم. توون؛ دەرەک؛ بن و بێخی دۆژەه؛ بنی جەحانم.

▣ **به درک**: بە توون؛ فینار؛ وە جەحانم؛ بە دەرەک؛ وشەیەک بە نیشانەی سەرنج نەدان بە ڕووداوێک ‹گفت: «می‌روم و پشت سرم را نگاه نمی‌کنم»، گفتم: «به درک»: گوتی: «دەڕۆم و ناگەڕێمەوە»، وتم: «بە توون»›.

**درک** / dark /: [عربی]/اسم. ۱. دەرک؛ فام؛ ئاوەز؛ سەرەدەر؛ سەرودەر؛ کار یان ڕەوتی ئاوەزین؛ زانین و لە شتێک تێگەیشتن ۲. *[ادبی]* دۆخ یان چۆنیەتی گەیشتن بە شتێک.

▣ **درک کردن**: ۱. ئاوزان؛ ئاوزیان؛ ئاوزین؛ ئاوەزیەی؛ ئاوەزیای؛ فامین؛ تێگەیشتن؛ مسایش؛ مسایە؛ سەر دەرهێنان ۲. *[ادبی]* بوون؛ شایەت بوون؛ دیتن ‹محضر آن اُستاد بزرگ را درک کردم: خزمەتی ئەو مامۆستا گەورەیە بووم›.

**درکردن** / darkardan /: *مصدر. لازم. متعدی.* //**درکردی**: دەرت‌کرد؛ **درمی‌کنی**: دەردەکەی؛ **درکن**: دەرکە// ☐*لازم.* ۱. دەرکردن؛ وە دەرنان ‹خستگی درکردن: شەکەتی دەرکردن› ☐ *متعدی.* ۲. هاویشتن؛ خستن؛ تەقاندن؛ کەواندن؛ وستەی؛ بەرکەردەی ‹تیر درکردن: تیر خستن›. هەروەها: **درکردنی**

■ **صفت فاعلی**: **درکننده** (دەرکەر)/ **صفت مفعولی**: **درکرده** (دەرکراو)/ **مصدر منفی**: **درنکردن** (دەرنەکردن)

**درگاه** / dargāh ، ـها/:اسم. ۱. بەرەگا؛ دەرکە؛ دەری؛ دەرگا؛ درگا؛ دریا؛ ناودرگا؛ قاپی؛ گوشادی دیوار کە چوارچێوەی درگای تێ دادەنێن ۲. *[نامتداول]* دەرکە؛ دەری؛ بەردەرک؛ بەردەرگا؛ بەردریا؛ وەربەرە؛ وەروو بەرەی ۳. درگانە؛ دریانە؛ ئاسان؛ ئاسانە؛ دەریزان؛ دەرازین؛ گەورەماڵ؛ خانووی خێوانی هێز و گەورەیی.

**درگاهی** / dargāhî ، ـها/:اسم. ۱. قووپاوی نێو

دیوار، لە بنی زەویەوە تا باڵای مرۆڤێ بە شێوەی دۆڵاوچەیەکی بێدەرک ۲. *[گفتاری]* ناودەرگا؛ ناودریا؛ نێو دەرکە.

**درگذشت** / dargozašt/: *اسم. [ادبی]* مەرگ؛ کۆچی دوایی؛ کارەڕەهاتی مردن؛ تێدا چوون؛ تیا چوون؛ کۆچی‌دوایی کردن ‹درگذشت دوست عزیزمان را در سانحەی رانندگی تسلیت می‌گوییم: مەرگی دۆستی خۆشەویستمان لە کارەساتی ڕانندەگیدا سەرەخۆشی دەکەین›.

**درگذشتن** / dargozaštan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* //**درگذشتی**: مردی؛ **درمی‌گذری**: دەمری؛ **درگذر**: بمرە// ۱. مردن؛ مەردەی؛ نەمان؛ تێدا چوون؛ تیا چوون؛ کۆچی دوایی‌کردن ۲. خۆش بوون؛ بواردن؛ بووردن؛ ویەردەی؛ لە مافی خۆ چاوپۆشی‌کردن ‹از گناه کسی درگذشتن: لە گوناهی کەسێک خۆش بوون› ۳. تێپەڕ بوون؛ دەرباز بوون؛ ویەردەی.

■ صفت فاعلی: **درگذرنده** (ــ)/ صفت مفعولی: **درگذشته** (مردوو)/ مصدر منفی: **درنَگذشتن** (نەمردن)

**درگذشته** / dargozašte، ـها؛ ـگان/: *اسم. [ادبی]* کۆچ‌کردوو؛ مردوو؛ مردی؛ مردگ؛ مەردە؛ نەماو.

**درگرفتن** / dargereftan/: *مصدر. لازم.* // **درگرفت**: دەسی پێکرد؛ **درمی‌گیرد**: دەس پێدەکا؛ ــ// دەس‌پێکردن؛ هەڵگیرسان؛ هەڵبوون (بۆ ئاور)؛ دەس پنەکەردەی؛ تێبەر بوون؛ دەس پێکردنی کار یان کاردانەوەی شتێک (تەنها بە شێوەی سێهەم کەسی تاکی ڕابردوو و داهاتوو بە کار دەڕوا) ‹درگرفتن جنگ؛ درگرفتن آتش: دەس پێ‌کردنی شەڕ؛ تێبەر بوونی ئاگر›.

■ مصدر منفی: **درنَگرفتن** (دەس پێ‌نەکردن)

**درگوشی** [1] / daregûšî/: *صفت.* چپە؛ چوە؛ چفە؛ پچە؛ فسە؛ چرپە؛ سرپە؛ نچ؛ تایبەتمەندی قسە کردنی هێواش و دە پەنا گوێی یەکتر ‹درگوشی ممنوع: چپە قەدەغەیە›.

**درگوشی** [2]: *قید.* بە پچە؛ بە پچە‌ـپچەوە؛ بە چپە؛ بە سرتە؛ بە سرکە؛ بە فسە؛ بە سرپە‌ـسرپەوە؛ چپە‌ـچپ؛ نچ؛ بناگوێ؛ بە هێواشی و لە لای گوێی بیسەرەوە ‹دو نفری داشتند درگوشی حرف می‌زدند: دوانی دانیشتبوون و بە پچە قسەیان دەکرد›.

**درگه** / dargah/: *اسم. [مخفف، ادبی]* دەرک؛ دەرکە؛ درگا؛ دریا.

**درگیر** / dargîr/: *صفت.* گیرۆدە؛ دەرگیر؛ ئاوقەد؛ ئامقە؛ تووش؛ تووشیاری بارێکی سەخڵەت و دژوار ‹خودت را با این کارها درگیر نکن: خۆت گیرۆدەی ئەم کارانە مەکە›. هەروەها: **درگیر بودن؛ درگیر شدن؛ درگیر کردن**

**درگیراندن** / dargîrāndan/: *مصدر. متعدی.* گیرۆدەکردن؛ پێوە تلاندن؛ تووش کردن.

**درگیری** / dargîrî، ـها/: *اسم.* دەرگیری: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی تووشی شەڕ و ناکۆکی بوون ‹با ادارەی آموزش و پرورش درگیری داشت: لەگەڵ مەزرینگەی پەروەردەدا دەرگیری بوو› ۲. کێشەوهەرا؛ مشت‌ومڕ؛ بەربەرەکانێ و شەڕ؛ کار یان ڕەوتی لێکدان؛ ململانێ؛ شەڕ و پێکدادان؛ ‹تظاهرات بە درگیری کشیده شد و چند نفر زخمی شدند: خۆپیشاندان کێشایە لیکدان و چەند کەسێک بریندار بوون›.

▣ **درگیری لفظی**: بنار؛ گلتە؛ دەمەقاڵە؛ دەمە قرێ؛ شەڕە قسە.

**درل** / derel/: [انگلیسی] ☜ **دریل**

**درم** / deram/: [از یونانی] *اسم.* درەم؛ دیرهەم؛ یەکەی پارەی برێ لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.

**درمان** / darmān، ـها/: *اسم.* دەرمان: ۱. هەتوان؛ داودەرمان؛ کۆمەڵە کار و ئامرازێ کە بۆ چا بوونەوەی نەخۆشێک بە کار دەبرێن ‹صدها بیمار در این بیمارستان درمان شده‌اند: سەدان نەخۆش لەم نەخۆشخانەدا دەرمان کراون›

۲. *[مجازی]* دەوا؛ چار؛ چارە ‹درمان درد من پول است: دەوای دەردی من پارەیە›.

**درمان‌بخش** / darmānbaxš/: *صفت. [ادبی]* هەتوان‌بەخش؛ دەرمان‌بەخش؛ بە توانایی و تایبەتمەندی دەرمان‌کردنەوە. هەروەها: **درمان‌بخشی**

**درمانجو** / darmāncû ، ـها؛ ـیان/: *اسم.* دەرمانخواز؛ دەرمان‌پرس؛ کەسێ کە وا لە دووی دەرمانی نەخۆشی خۆیەوە ‹هر روز ۵۰ نفر درمانجو به ما مراجعه می‌کنند، که بسیاریشان اصلاً بیمار نیستند: هەموو رۆژێ ۵۰ دەرمانخواز دێن بۆ لامان، کە زۆربەیان هەر نەخۆش نین›.

**درماندگی** / darmāndegî/: *اسم.* داماوی؛ داماگی؛ تێماوی؛ قەتیسی؛ ماتی و سەرگەردانی؛ دۆخ یان چۆنیەتی داماو بوون ‹هم بیکارم، هم بیمار، هم بی‌پول، مگر درماندگی شاخ و دم دارد؟: هەم بێکارم، هەم نەخۆش و هەم بێ‌پارە، ئیتر داماوی چۆن دەبێ؟›.

**درماندن** / darmāndan/: *مصدر. لازم.// درماندی:* دامای؛ **درمی‌مانی:** دادەمێنی؛ **دربِمان:** دابمێنە// دامان؛ تێمان؛ تێدامان؛ تێدا مانەوە؛ قەتیس بوون؛ کەوتنە تەنگانەوە؛ پەک‌کەوتن؛ فل بوون؛ جەنیقین؛ فلتان؛ ئەرمەمنەی؛ مەنایرە؛ پەک کەوتەی؛ هێز و توانی جێبەجێ‌کردنی کارێک لە دەس‌دان ‹درمانده بودم چه جوابی به او بدهم: تێیدا مابوومەوە چ پەرسڤێکی پێ بدەمەوە›. هەروەها: **درماندنی**

■ صفت مفعولی: **درمانده** (داماو)/ مصدر منفی: **درنَماندن** (دانەمان)

**درمانده** / darmānde ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* داماو؛ داماگ؛ داماتی؛ تێماو؛ گونەک؛ کلۆل؛ بێچارە؛ لێ‌قەوماو؛ مەنە؛ وامەنە؛ ئەرەمەنە؛ دەرمەنە؛ ئەڕامەندە؛ ئەرامەنە؛ لاکەفتە؛ بارکەوتە؛ لاکەوتە؛ پەک‌کەوتە؛ وەستاو؛ قەتیز؛ قەتیس؛ بێ‌دەرەتان؛ ناکار لە دۆزینەوەی چارە ‹وقتی به کلی درمانده شد، سراغ پدرزنش رفت: کاتێ بەتەواوی داماو کەوت، چوو بۆ لای خەزوورەی›.

**درمان‌شناسی** / darmānšenāsî/: *اسم.* دەرمان‌ناسی؛ لقێک لە زانستی پزیشکی کە لە سەر دەرمانی نەخۆشیەکان دەکۆڵێتەوە.

**درمانگاه** / darmāngāh ، ـها/: *اسم.* دەرمانگا؛ دەرمانخانە؛ دامەزراوەیەک بە کارکەرانی پزیشکی و ئامێرگەلی دەرمانیەوە بۆ دەرمان کردنی نەخۆشی سەرەپایی.

**درمانگاهی** / darmāngāhî/: *صفت.* دەرمانگایی؛ دەرمانخانەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە دەرمانگاوە ‹فعالیتهای درمانگاهی: چالاکیگەلی دەرمانگایی›.

**درمانگر** / darmāngar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* دەرمانکەر؛ دەرمانگەر؛ کەسێ کە نەخۆشان دەرمان دەکات.

**درمانی**[1] / darmānî/: *صفت.* دەرمانی؛ پێوەندیدار یان سەر بە دەرمانەوە ‹هزینەهای درمانی: خەرجگەلی دەرمانی›.

**ـ درمانی**[2]: *پیوازه.* ـدەرمانی؛ دەرمان کردن ‹پرتودرمانی؛ برق‌درمانی: تیشک‌دەرمانی؛ کارەبادەرمانی›.

**درمنه** / dermane, darmane ، ـها/: *اسم.* گیابەرک؛ بەرزەڵەنگ؛ بەرزەڵین؛ زەنگۆڵەگیا؛ گیایەکی خۆڕسکی لاسک کلۆری بۆنخۆشە.

**درنا** / dornā/: [ترکی] *اسم.* ۱. *[نجوم]* وێنەیەکی ئاسمانی باشووری ۲. ـها؛ ـان/ قازیقولنگ؛ قازیقولینگ؛ قولنگ؛ قوڵنگ؛ قورنگ؛ قورینگ؛ شینەقورینگ؛ قوڵەنگ؛ قولینگە؛ قەتارقولینگ؛ کولنگ؛ باڵدارێکی کێوی بە لەش و مل و باڵ و پای درێژ، دەندووکی بلیند و ئەستوورەوە.

**درنبردن** / darnabordan/ ☜ **دربردن**

**درندشت** / darandašt/: *صفت. [گفتاری]* دەرەندەشت؛ هەشتەرخان؛ کاکی‌بەکاکی؛ بە دەرەتانێکی زۆر بەربڵاوەوە ‹اتاق درندشت؛

زمین درندشت: ژووری دەرندەشت؛ زەمینی کاکی بەکاکی›.

**درندگی** / dar(r)andegî, der(r)andegî/: اسم. درندەیی؛ دڕی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دڕندە بوون ‹شیر به آن درندگی را رام کرده است: شێری بەو دڕندەیی‌ەی دەستەمۆ کردووە›.

**درنده** / dar(r)ande, der(r)ande، ـها؛ ـگان/: صفت. دڕندە؛ دڕ؛ دڕنە؛ دوڕوننە؛ دەعبە؛ تێرووو؛ ڕاور؛ بە تایبەتمەندی و توانای دڕ بوونەوە ‹جانور درنده: گیانەوەری دڕندە›.

**درنده‌خو** / dar(r)andexû, der(r)andexû، ـها؛ ـیان/: صفت. دڕندە؛ دڕ؛ خاوەن تایبەتمەندی و خووی گیانەوەرانی دڕندە و وەحشی ‹این مرد درنده‌خو حتی به کودکان خود رحم نکرد: ئەم کابرای دڕە بەزەی بە منداڵەکانی خۆشیدا نەهات›.

**درنده‌خویی** / dar(r)andexûyî, der(r)ande-، ـها/: اسم. دڕندایەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دڕ بوون ‹زبان از توصیف درنده‌خویی او قاصر است: زمان کوڵە لە دەربڕینی دڕندایەتی وی›.

**درنرفتن** / darnaraftan/ ☜ **دررفتن**

**درنکردن** / darnakardan/ ☜ **درکردن**

**درنگ** / derang, darang/: اسم. [ادبی] ۱. درەنگ؛ دێر؛ دێرس؛ دواکەوت؛ خۆپارێزی لە جێبەجێ کردنی کارێک بۆ ماوەیێ ‹در این کار درنگ جایز نیست: لەم کارەدا درەنگ ڕەوا نیە› ۲. خۆڕاگری؛ سەبر ‹لختی درنگ کن که دیگران هم برسند: تۆزێ سەبر کە با ئەوانیش بگەن›. هەروەها: **درنگ کردن**

**درنگذشتن** / darnagozaštan/ ☜ **درگذشتن**

**درنگرفتن** / darnagereftan/ ☜ **درگرفتن**

**درنماندن** / darnamāndan/ ☜ **درماندن**

**درنوشتن** / darneveštan/ ☜ **نوَردیدن ــ۱**

**درنیافتن** / darnayāftan/ ☜ **دریافتن**

**درنیامدن** / darnayāmadan/ ☜ **درآمدن**

**درنیاوردن** / darnayāvardan/ ☜ **درآوردن**

**درنیاویختن** / darnayāvîxtan/ ☜ **درآویختن**

**درنیفتادن** / darnayoftādan/ ☜ **درافتادن**

**درو** / derow, dero:/: اسم. ۱. دروێنە؛ دروێن؛ درەو؛ درێنە؛ کار یان ڕەوتی بڕینەوەی ڕووەکی کێڵگە یان زەمینێک ‹فصل درو: وەرزی دروێنە› ۲. [کنایی] قەڵتوبڕ؛ کوشتاری بە کۆمەڵی گیانەوەران، بەتایبەت مرۆڤ؛ داپاچین ‹با مسلسل همه را درو کردند: به مترالیۆز هەموویان قەڵتوبڕ کرد›.

▣ **درو کردن**: دروێنەکردن؛ درەوکردن؛ دووران؛ دروان؛ درەوکەردەی.

**دروازه** / darvāze، ـها/: [از کردی] اسم. [قدیمی] دەروازە: ۱. قاپیە؛ دەرگای مەزن؛ درگاقابی؛ درگایەکی گەورە کە لەوێوە بۆ ناو شار یان قەڵایەک دەچوون ‹شبانه دروازه را به روی سپاه دشمن گشودند: بە شەودا دەروازەیان بۆ سوپای دژمن کردەوە› ۲. [مجازی] شوێن یا جێگایێ کە لەوێوە دەچنە نێو شوێنێ‌تر ‹دروازه‌ی تمدن: دەروازەی شارستانیەت› ۳. [ورزش] گول؛ گۆڵ؛ جێگایەک لە دوو سەری گۆڕەپانی یاری فووتباڵ و چەند یاری‌تر کە دەبێ تۆپی تێ کەوێ.

**دروازه‌بان** / darvāzebān، ـها؛ ـان/: [از کردی/فارسی] اسم. دەروازەبان؛ دەروازەوان: ۱. [قدیمی] قاپیەوان؛ قاپیەڤان؛ نواوان ۲. [ورزش] گوڵگێر؛ یاریزانێ کە ئاگای لە دەروازەیە، تۆپی تێ نەچێ. هەروەها: **دروازه‌بانی**

**دروپیکر** / dar-o-peykar/: اسم. دەر و دیوار؛ درگا و پەنجەرە؛ درگا و دیوار و کۆمەڵی ئەو شتانەی کە ئەبێتە هۆی مان و پاوان بوونی خانوویەک ‹خانه کهنه و قدیمی بود و در و پیکر درستی نداشت: خانووەکە زۆر کۆن بوو، دەر و دیوارێکی ڕێک‌وپێکی نەبوو›.

**دروتخته** / dar-o-taxte/: اسم. [قدیمی] پێکهاتەیەک لە چێو (تەختە) بۆ داپۆشینی ڕووی شووشە یان دەربیجە، کە بە پێچ بە ڕووی

درگای دووکاندا دەیانبەستەوە.

▣ **در و تخته به هم جور بودن:** *[مجازی]* بۆ یەک تاشیان؛ جفت و جۆر بوون.

**درود** / durûd, dorûd/: *دعا.* ١. دورووود؛ شاباش؛ شابە؛ شەگە؛ شاگە؛ وشەیەک بە نیشانەی پەسند، پەسن یان خێراتی ‹درود بر قهرمانان وطن: درووود بۆ قارەمانانی نیشتمان› ٢. *[ـها/ [ادبی]* سەلام؛ سڵاو؛ سەلام؛ سڵاڤ. هەروەها: **درود گفتن؛ درود فرستاندن**

**درودگر** / durûdgar, dorûdgar، ـها؛ ـان/: *اسم. [ادبی]* چێوتاش؛ چووتاش؛ دارتاش؛ مەرەنگۆز؛ نەجاڕ.

**درودگری** / durûdgarî, dorûdgarî، ـها/: *اسم. [ادبی]* چێوتاشی؛ دارتاشی؛ مەرەنگۆزی؛ نەجاڕی.

**درودن** / durûdan, dorûdan/ ☜ **درَویدَن**

**درودیوار** / dar-o-dîvār، ـها/: *اسم.* دار و دیوار؛ دەر و دیوار؛ دەرک و بان؛ دەر و دوو؛ ئەوەی کە جێگایەک لە دەرەوەی جوێ دەکاتەوە (وەک دیوار و دەرگا و پەنجەرە) ‹در و دیوار را تمیز کرده و آذین بسته بودند: دار و دیواریان خاوێن‌کردبووەوە و خەملاندبوویان›.

**دروزی** / darûzî، ـها؛ ـان/: [؟]*اسم.* دەروزی؛ هەر کام لە پەیڕەوانی لقێ لە مەزهەبی ئیسماعیلی بە ناوی دەرووز کە ئێستە زۆربەیان لە لوبنان و سووریە نیشتەجێن.

**دروس** / durûs, dorûs/: [عربی] جمعِ ☜ **دَرس**

**دروغ** / durûq, dorûq، ـها/: *اسم.* درۆ؛ ڤرۆ؛ ڤرکا؛ ڤـڕی؛ درۆی؛ درۆێ؛ درێ؛ دروو؛ درەو؛ دەرەو: ١. فیشاڵ؛ ئاخـڵێف؛ قەوانـە؛ هـەڵات؛ پـۆت؛ قسەی هەڵبەستە و ناڕاست کـە بـە مەبەستی فریودان یا شوێنەگومکێ دەگوترێ ‹برای این‌که تنبیه نشود، دروغ گفت: بـۆ ئـەوەی جزیـا نـەدرێ، درۆی‌کرد› ٢. قسەیەکی ناڕاست یـان نادروست کە وێدەچێ بێژەر چۆنیەتیەکەی بزانێ یـان نەزانێ ‹خبر دروغ: هەواڵی درۆ›.

▣ **دروغ دسته نقاشی:** *[مجازی]* درۆی وەک ڕاست؛ درۆی داتاشراو؛ درۆیەک کـە بـە زانیاریەوە سازکرابێ.

**دروغ شاخدار:** *[مجازی]* تۆپ؛ هەڵات؛ هووشە؛ درۆی زل.

**دروغ مصلحت‌آمیز:** درۆی مەسڵەحەتی؛ درۆیەک کـە بـۆ کوژاندنـەوەی بـشێوە و وەیـشوومە و بـەرگری لـە گـەزن و زیـان دەگوترێ.

▣ **دروغ بافتن** ☜ **دروغ‌بافی**

**دروغ تراشیدن:** درۆ هەڵبەستن؛ درۆ تاشـین؛ درۆ درووس‌کردن؛ درۆ داتاشین؛ شەنتین.

**دروغ درآمدن:** بـە درۆ دەرچـوون؛ بـە درۆ دەرهـاتن؛ بـە درۆێ بەرشـیەی؛ ڕاسـت دەرنەهاتن؛ ڕوون بوونەوەی درۆ بـوونی وتـە، ڕووداو یان هەواڵێک ‹خبر آتش‌بس دروغ درآمد: هەواڵی ئاگربەس بە درۆ دەرچوو›.

**دروغ ساختن** ☜ **دروغ‌سازی**

**دروغ کسی را درآوردن:** *[مجازی]* کەسێ بـە درۆ خستنەوە؛ درۆی کەسێ خـستنە دەرەوە؛ کەسێک خستنە درۆوە؛ وسەیوە درۆ؛ ئەوەدرۆ وسـەی؛ ڕوون‌کردنـەوەی درۆی کەسـێ کـە پێشتر هەڵیبەستووە ‹از این‌که دروغ او را درآوردم از من دلخور شد: لەوەی کە بە درۆم خستەوە لـێم زیز بوو›.

**دروغ گفتن:** درۆکردن؛ درۆدان؛ ددانـدن؛ درۆ دای؛ درێ‌کەردەی؛ درویێ دای؛ درۆ وتن.

**دروغ‌بـافی** / durûqbāfî, dorûq-، ـها/: *اسم. [مجازی]* درۆبـازی؛ کـاری درۆ هەڵبەسـتن؛ درۆ نانەوە؛ هەڵبەستن و ئامادەکردنی درۆ ‹تهمت‌زنی و دروغ‌بـافی بـر علیه روشنفکران بـازار گرمـی یافت: بوختیان کردن و درۆ هەڵبەستن دژ بە ڕووناکبیران برەوی پەیدا کرد›. هەروەها: **دروغباف**

**دروغ‌پراکنی** / durûqparākanî, dorûq-، ـها/: *اسم.* درۆوەشێنی؛ کار یان ڕەوتی بڵاوکردنـەوەی

قسه و باسی درۆ. هەروەها: **دروغپراکن**

**دروغپردازی** / durûqpardāzî, dorûq- ، ـها/: *اسم.* درۆبازی؛ کاری درۆ هەڵبەستن؛ درۆ نانەوە؛ هەڵبەستن و ئامادەکردنی قسەی درۆ. هەروەها: **دروغپرداز**

**دروغ ـ دونگ** / durûqdavang, dorûq- ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* درۆـدەلەسە؛ درۆ و دەلەسە؛ درۆـدەلەسێ؛ قسەی درۆ ‹اینقدر دروغ‌ـدونگ سر هم نکن: ئەوندە درۆـدەلەسە مەتاشە›.

**دروغزن** / durûqzan, dorûq- ، ـها/: *صفت. [قدیمی]* درۆزن؛ درەوکەر؛ دەرەوین؛ درۆزە؛ ڤرڤرۆ؛ ڤرۆکەر؛ ڤرڤرە؛ فیشاڵباز.

**دروغزنی** / durûqzanî, dorûq-/: *اسم.* درۆزنی؛ درەوکەری؛ دەرەوینی؛ ڤرۆکەری؛ فیشاڵبازی.

**دروغسازی** / durûqsāzî, dorûq-/: *اسم.* درۆسازی؛ درۆزنی؛ کاری هەڵبەستن و ئامادە کردنی قسەی درۆ؛ درۆ هەڵبەستن؛ درۆ نانەوە ‹به زودی آن نشریه معتبر بـه کارخانـه‌ی دروغسازی تبدیل شد: زۆر زوو ئەو گۆڤارە بەبڕ و ناسراوە بوو بە کونی درۆ هەڵبەستن›.

**دروغسنج**/ durûqsanc, dorûq-/ ☜ **دروغیاب**

**دروغکی** / durûqakî, dorûq-/: *قید. [گفتاری]* بە درۆ؛ بە درۆوە؛ بە درۆی؛ بە درێ؛ درۆیی ‹دروغکی گفت می‌خواهد برود بانه: بە درووە گوتی ئەیەوێ بڕوا بۆ بانە›.

**دروغگو** / durûqgû, dorûq- ، ـها؛ ـیان/: *صفت.* درۆزن؛ درۆباز؛ درەوکەر؛ دەرەوین؛ درۆزە؛ ڤرۆکەر؛ ڤرەکەر؛ ڤرڤرە؛ هوفاڵ؛ چاخان؛ کەلاج؛ فیشاڵباز؛ بافیش‌کەر؛ ڕاست‌نەبێژ. بەرانبەر: **راستگو** ‹دروغگو دشمن خداست: درۆزن دوژمنی خوایە›.

**دروغگویی** / durûqgûyî, dorûq- ، ـها/: *اسم.* درۆزنی؛ درۆکەری؛ درۆبازی؛ فیشاڵبازی؛ چاخانی؛ ڤرۆکەری؛ کار یان ڕەوتی درۆکردن ‹از دروغگویی پسرش شکایت داشت و خیلی نگران بود: لە درۆزنی کوڕەکەی گازندەی دەکرد و زۆر پەرێشان بوو›.

**دروغنما** / durûqnemā, dorûq-/ ☜ **دروغیاب**

**دروغی** / durûqî, dorûqî/: *صفت.* درۆیی؛ درۆیینە؛ درۆینە؛ درۆزنە ‹ورزشکار دروغی: وەرزشکاری درۆیی›.

**دروغیاب** / durûqyāb, dorûq- ، ـها/: *اسم.* درۆدۆز؛ درۆ دەرخەر؛ ئامێرێک بۆ هەڵسەنگاندنی ڕاستی یان نادروستی قسەی وێژەر لە سەر بڕێ چالاکی مرۆڤ (وەکوو هەناسە و لێدانی دڵ و...): **دروغنما؛ دروغسنج**

**دروغین** / durûqîn, dorûqîn/: *صفت. [ادبی]* درۆیی؛ درۆینە؛ درۆینە؛ درۆزنە.

**دروگر** / derowgar, dro:gar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ۱. دروێنەوان؛ درەوان؛ پاڵە؛ ناندروو؛ درەوکەر؛ کەسێ کە کاری درەوکردنە ۲. درەوگەرد؛ دەڕاسە؛ دروێنەک؛ لاوێردە؛ ماشینێ کە درەو دەکا.

**درون** / darûn, dorûn/: *اسم. [ادبی]* ناوەوە: ۱. ناو؛ نێو؛ ژوور؛ هەندروو؛ هوندر؛ هەندەروون؛ دەروون؛ ئەندەروون؛ دڵێ؛ بۆشاییەک کە لە نێوان دیوار، لەمپەر یان کەوشەنێکدایە ‹درون خانە: ناو ماڵ› ۲. ناو؛ نێو؛ بەشی ناوەوەی هەر شتێک. بەرانبەر: **بیرون** ‹درون و بیرون آن را بەخوبی بررسی کرد: دەر و ناوەوەی باش‌ـباش تاوتوێ کرد› ۳. *[مجازی]* زەین؛ ئاوەز؛ هزر.

**درون** / darûne, dorûne/: *حرف.* لە ناو؛ ناو؛ ناوەوە؛ لە ناوەوە؛ نێو؛ لە نێو؛ دڵێ؛ دڵێو؛ دڵۆ ‹درون حیاط حوض بزرگی است: حەوزێکی گەورە لە ناو حەوشەکەدایە›.

**درونبر** / darûnbar ، ـها/: *اسم. [گیاه‌شناسی]* توێکڵی ناوەوەی بەری دار کە دەکرێ توێژێکی ناسکی لێ بێ (وەک هەرمێ) یان سفت و پتەو ببێتەوە و ببێتە پێشە (وەک گوێز).

**درونبوم** / darûnbûm ، ـها/: *اسم. [جغرافیا]*

نێوهەرێم؛ بەشی ناوەوەی هەر وڵاتێک (وەکوو شار، باژێر یان پارێزگا).

**درون‌بین** / darûnbîn ، ـها/: *اسم. [پزشکی]* ئاندوسکوپ؛ هەناوبین؛ هەناڤبین؛ ئامێرێکی بژیشکی بۆ بینینی ناوەوەی لەش.

**درون‌بینی** / darûnbînî ، ـها/: *اسم.* ۱. *[پزشکی]* ئاندوسکوپی ۲. دەروون‌بینی؛ هەناوبینی؛ توێژینەوە و تاوتوێی بیر و باوەڕ و هەستی خۆ: **درون‌نگری**

**درونپرده** / darûnparde/: *اسم. [کالبدشناسی]* پاوڕ؛ ناوەکی‌ترین پەردەی پزدان کە تۆڵی دەورە داوە و بەسراوە بە ناوکەوە: **آب‌پرده؛**

**درونشامەی رویانی؛ مشیمه**

**درونپوست** / darûnpûst/: *اسم.* ناوپێست؛ ناوەپۆس: ۱. *[کالبشناسی]* ناوەکی‌ترین توێژی سەرەتایی تۆڵ کە پۆشەنی ناوەکی لوولەی هەرس پێک‌دێنێ ۲. *[گیاەشناسی]* ناوینترین توێژی تۆکڵی لاسک یان ڕیشوو.

**درونپوش** / darûnpûš/: *اسم. [کالبدشناسی]* ناوەپۆش؛ ناوپش؛ توێخێ لە شانەی پۆشەنی دەروونی کە دڵ و دەماری مۆرەداران وەک ئاستەر دادەگرێ.

**درونتراو** / darûntarāv/ ☜ **درونریز**

**درونْدل** / darûndel/ ☜ **درونشامه**

**درونراند** / darûnrānd/: *اسم.* ڕەوتی دەڵان؛ دزە کردن؛ گەڕانەی بواردنی ماک‌گەل لە شوێنێکی بە گوشارەوە بۆ شوێنێکی کەم گوشارتر.

**درونروی** / darûnrûy ، ـان/: *صفت. [گیاەشناسی]* بە تایبەتمەندی یان توانایی ڕوان لە ناو ئەندامانی ڕووەکێکی‌تردا.

**درونریز** / darûnrîz ، ـها/: *صفت. [زیستشناسی]* نێوانرێژ؛ دەناورێژ؛ بە نمتکی ناوەکیەوە ‹غدەی درونریز: لکی نێوانرێژ›: **درونتراو**

**درونزا** / darûnzā ، ـها؛ ـیان/: *صفت.* بە تایبەتمەندی یان توانایی هەڵکەوتن و گەورە بوون بە یارمەتی هۆکارگەلی دەروونیەوە. بەرانبەر: **برونزا**

**درونزاد** / darûnzād/: *صفت.* ۱. ـان/ *[گیاەشناسی]* پێکهاتوو لە شانەگەلی ناوەکی گیا (وەک ریشووی لاوەکی) ۲. *[زمین‌شناسی]* بە سەرچاوەی ناوەکیەوە (وەک بەردی ئاگرین).

**درونزهر** / darûnzahr/: *اسم. [زیست‌شناسی]* ناوەژار؛ ژاری ناوەوەی باکتری کە تەنیا دوای لەناو چوونی باکتری دێتە دەرەوە.

**درونسو** / darûnsû/: *اسم.* ناو؛ ناوەوە؛ دیوی ناوەوە؛ لای ناوەوە؛ ڕوو یان لای ناوەوەی هەر شتێ.

**درونسوز** / darûnsûz/ ☜ موتور درونسوز، **موتور**

**درونشامه** / darûnšāme/: *اسم. [کالبدشناسی]* پەردەیێ کە ڕووی ناوەوەی ماسوولکەکانی دڵ و دەربیژەکانی دادەپۆشێ: **درونْدل**

◙ **درونشامەی رویانی** ☜ **درونپرده**

**درونگانی** / darûngānî/: *اسم. [زیست‌شناسی]* ناوگانی؛ تێکەڵی نێوان دوو بوونەوەری لێک‌نزیک، بەتایبەت گەردەی دوو گوڵی گیایەک.

**درون‌گرایی** / darûngerāyî/: *اسم.* هۆگری بە سەرکردنە ناو کاوڵ و توێکڵی خۆوە و دووری و جیایی لە ژیانی ئاپۆرەیی. بەرانبەر: **برون‌گرایی**. هەروەها: **درونگرا**

**درونگروهی** / darûngurûhî, -gorûhî/: *صفت.* ناوخۆیی؛ نێودەستەیی؛ نێوگرووپی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کار و باری ناو خۆی دەستە یان گرووپێکەوە ‹اختلافات درونگروهی؛ بحثهای درونگروهی: ناکۆکی ناوخۆیی؛ **باسی** ناوخۆیی›.

**درونمایه** / darûnmāye/: *اسم.* ناوەرۆک؛ ناوەرۆکە؛ کاکڵە؛ بیر یان مەبەستی باس یان بەرهەمێکی هونەری.

**درونمرزی** / darûnmarzî ، ـها/: *صفت.* ناوخۆیی؛ ناوەکی؛ پێوەندیدار بە ناوەوەی وڵات

‹برنامه‌ی درونمرزی رادیو: بەرنامەی ناوخۆیی ڕادیۆ›.

**درون‌نگری** / darûn.negarî/ ☜ **درون‌بینی ـ۲**

**درون‌همسری** / darûnhamsarî ، ـھا/: *اسم.* *[جامعه‌شناسی]* ژن و ژنخوازی ناوخۆیی؛ هاوسەردۆزی و زەماوەند لە ناو دەستەیەکدا (وەک بنەماڵە و خێڵ) بە هۆی باو یان قانوونەوە.

**درونی** / darûnî, dorûnî/: *صفت.* دەروونی: ۱. ناوەکی؛ ناوی؛ ناوەوەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ناوەوە ‹اتاقهای درونی ساختمان: ژوورگەلی ناوەکی خانوو› ۲. *[مجازی]* هزری؛ پێوەندیدار بە هۆش و بیرەوە ‹احساس درونی: هەستی دەروونی›.

**دروهمسایه** / dar-o-hamsāye ، ـھا/: *اسم.* *[گفتاری]* هاوسا و بەراوسا؛ هاوسا و دەراوسا؛ هاوسێ‌دراوسێ؛ کەسانێ کە لە هاوسێتی جێگاییێکەوەن ‹ما پیش در و همسایه آبرو داریم: ئێمە لای هاوسا و بەراوساوە ئابڕوومان هەیە›.

**درویدن** / deravîdan/: *مصدر. متعدی.*// **درویدی:** دووریت؛ **می‌دروی:** دەدرووی؛ **بدرو:** بدروو// دووریـن؛ دروون؛ درون؛ دروین؛ درەکەردەی؛ دروونەوە؛ دوورانەوە؛ دوراننەوە؛ دووران؛ درویان؛ درووینەوە؛ دووران؛ چنین؛ بە دەسکە بڕینی ئالف و گیا بە داس، ماڵەغان یان هەر شتێ کە تیژ بێ: **دُرودَن** *[ادبی]*

■ صفت فاعلی: **درونده** (دروێنەر)/ صفت مفعولی: **درویده** (درواو)/ مصدر منفی: **نَدرویدن** (نەدروان)

**درویش**[1] / darvîš ، ـھا، ـان؛ دراویش/: *اسم.* دەروێش؛ دەورێش؛ دوریش؛ دەرویش: ۱. کەسێ کە پەیڕەوی یەکێک لە فیرقەکانی سۆفیەیە ۲. ڕیتاڵە؛ ڕینگاڵ؛ قەلەندەر؛ عەبداڵ؛ کەسێکی گەڕاڵ کە بە جلوبەرگێکی تایبەت و کەشکۆڵ و تەوەرزینەوە بە کووچە و کۆڵاناندا دەگەڕێ و شیعر دەخوێنێ و لە خەڵکی پارە دەستێنێ.

**درویش**[2]: *صفت.* ۱. *[مجازی]* سەرپەتی؛ گوێ‌نەدەر بە دنیا و ماڵ و سامان و ناوبانگ و پلە و پایە ۲. *[ادبی]* ڕەبەن؛ هەژار.

**درویشی** / darvîšî/: *اسم.* ۱. دەورێشی؛ دەرویشی؛ کاری دەرویش ۲. *[ادبی]* هەژاری؛ ڕەبەنی.

**دره** / darre ، ـھا/: *اسم.* دۆڵ؛ دۆڵە؛ دۆیل؛ دویڵ؛ دەل؛ دەربەند؛ دەرقەن؛ کەور؛ دەهەل؛ دەرە؛ دەراو؛ دەراڤ؛ دراو؛ شیو؛ شیوەڵە؛ شیڤ؛ توو؛ کان؛ نوهێل؛ نوهال؛ نەهال؛ دوپ؛ گەلی؛ گەلی؛ گلال؛ لوف؛ لووف؛ خانۆک؛ قووڵایی نێوان دوو کێو.

**درهم**[1] / darham/: *صفت. [گفتاری]* ۱. ئاوێتە؛ تێکەڵ؛ تێکل؛ تەڤل؛ گۆل؛ گژۆلە؛ تێکەلاو بە سەر یەکدا ۲. تێکەڵ‌ـپێکەڵ؛ تێکەڵ‌وپێکەڵ؛ شڵەژاو؛ پەرێشان؛ شێواو؛ ئالۆز؛ هەڵشێواو؛ شێویاگ؛ شێویاو؛ چەواشە؛ تێک‌چوو؛ ژەلمسە؛ منتەوەش؛ بێ سەرە و بەرە.

⊡ **درهم آمیختن:** تێکەڵ کردن؛ تێکەلاوکردن؛ شەوهاندن؛ ڤەخوماندن؛ هەربلین؛ هەبلین؛ کەرچلاندن؛ جەمقاندن؛ گژاندن؛ ڕژاندنە یەک؛ تەڤدان؛ هالۆزان؛ ئالۆزان؛ تێک‌هالان.

**درهم ریختن:** تێکەڵ‌ـپێکەڵ کردن؛ تێکەوەدان؛ ئالۆزاندن؛ شڵەژاندن؛ تێک‌هالان؛ ڕژانە یەک؛ بە یەکدا شێوان؛ تێک‌وپێک دەی/دای؛ ڕێک‌وپێکی و تەکووزی شتێک لە بەین بردن.

**درهم شدن:** ۱. تێکەڵ‌ـپێکەڵ بوون؛ شڵەژان؛ تێک‌چوون؛ ڤەخومان؛ ڤەخومین؛ شەوهان؛ پەرێشان بوون؛ شێوان؛ شێویان؛ تێک شیەی/شیای ۲. تێکەڵ بوون؛ تێکەلاو بوون؛ ڕژانە یەک. هەروەها: **درهم کردن**

**درهم فشردن:** تێک‌گووشین؛ تێک‌گواشتن؛ ڕێک‌گوشین؛ بە تەوژمی زۆرەوە بۆ هەموو لایەک گوشار هێنان. هەروەها: **درهم کوبیدن**

**درهم**[2]: *قید.* تێکەڵ؛ هالۆز؛ تێک‌هالاو؛ دەرهەم؛

تێکەڵاو؛ هەڕەمە؛ بە شێوەی تێکەڵ ـ پێکەڵ ‹همه را درهم می‌فروشیم: هەمووی تێکەڵ دەفرۆشین›.

**درهم** / derham ، ـها/: [معرب از یونانی]/اسم. دێرهەم؛ درهەم: ۱. [قدیمی] درەم؛ یەکەی پارەی زۆرێک لە وڵاتانی ئیسلامی لە ڕابردوودا ۲. یەکەی پارەی ئیماراتی عەرەبی و مەراکش.

**درهمجوش** / darhamcûš/: صفت. پێکەوەکوڵاو؛ لەگەڵ یەکتریدا بە تێکەڵی کوڵاو.

**درهمکنش** / darhamkoneš/ ☜ **برهمکنش**

**دری**[1] / darî/: اسم. ۱. دەربوونە؛ ئالوولە؛ ڕێگای تایبەتی (وەک: کۆڵان، دالان و...) کە دەرگای دەرەوەی دەکەوێتەوە سەر ڕێگەی گشتی ۲. ☜ فارسی دری، **فارسی**

**ـ دری**[2]: پیوازه. ـ دەرگایی؛ ـ دەری؛ ـ دەرکی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە دەرگاوە ‹پشت‌دری؛ پادری: پشت‌دەرکی؛ پادەرگایی› ۲. خاوەن دەرگا ‹پنجدری: پێنج‌دەری›.

**دریا** / daryā/: اسم. ۱. /ـها/ دەریا؛ دەلیا؛ زەریا؛ زریا؛ زەلیا؛ زرێ؛ زەری؛ زریە؛ کۆمە ئاوێکی زۆر گەورە لە ئاوی سوێر کە بە کۆمەگەلێکی دیکەوە ڕێی هەیە و وشکانی لە چەند لاوە دایگرتووە ۲. [مجازی] ئوقیانووس ۳. زێ؛ گۆلی گەورە؛ زێی گەورەی ئاوی سوێر ٤. [مجازی] دەریا؛ جێگایەکی زۆر گەورە کە زۆر شتی لێیە ‹شهر اربیل مثل یک دریا است: شاری هەولێر وەکوو دەریایەکە› ٥. [مجازی] دەریا؛ هێژا؛ هۆزان؛ زۆر زانا؛ کەسایەتی زۆر زانا و هێژا ‹مرحوم بدیع‌الزمانی دریا بود: خوالێخۆشبوو بەدیعوزمانی دەریایەک بوو›.

**دریائی** / daryā'î/ ☜ **دریایی**

**دریابان** / daryābān ، ـها؛ ـان/: اسم. دەریاوان؛ زەریابان؛ سەرلەشکری هێزی دەریایی. هەروەها: **دریابانی**

**دریابد** / daryābod ، ـان/: اسم. دەریابود؛ ئەرتەشبودی هێزی دەریایی. هەروەها: **دریابدی**

**دریاچه** / daryāče ، ـها/: اسم. دەریاچە؛ زێ؛ زرێبار؛ زریچە؛ بەهرک؛ بیرکم؛ بەرەم؛ بارهۆ؛ گۆل؛ بەشێکی زۆر لە ئاوی سوێر یان شیرین کە ڕێگای بە دەریا نیە.

**دریادار** / daryādār ، ـها؛ ـان/: اسم. دەریادار؛ سەرتیپی هێزی دەریایی. هەروەها: **دریاداری**

**دریادل** / daryādel ، ـان/: صفت. [مجازی] دڵ گەورە؛ خاوەن تابشتی خۆڕاگری، لێبوردوویی و ڕێکوپێکی زۆر. هەروەها: **دریادلی**

**دریازدگی** / daryāzadegî ، ـها/: اسم. دەریابردوویی؛ دەریاگەزی؛ باری هەڵشێوانی دڵ، سەرگێژە، سەرئێشە و سستی لە سەفەری دەریاییدا کە بە هۆی تەکان و شەکانی کەشتیەوە لە برێ کەسان ڕوو ئەدا ‹دریا توفانی بود و بیشتر مسافران دچار دریازدگی شده بودند: دەریا باسریشکی بوو و زۆرێک لە مسافرەکان تووشی دەریابردوویی ببوون›.

**دریازده** / daryāzade ، ـها؛ ـگان/: صفت. دەریاگەز؛ دەریابردوو؛ تووشی دەریابردوویی ‹دریازده شده بودم و حالت بدی داشتم: دەریاگەز ببووم و حاڵێکی شڕم بوو›.

**دریازن** / daryāzan ، ـان/: اسم. دەریاگر؛ دزی دەریا؛ چەتەی دەریایی.

**دریازنی** / daryāzanî ، ـها/: اسم. دەریاگری؛ کار و ڕەوتی دزینی کەشتی یان بردنی بارەکەی بە سەر ئاوەوە.

**دریازی** / daryāzî ، ـها؛ ـان/: صفت. [زیست‌شناسی] دەریاژی؛ زەریاژی؛ بە تایبەتمەندی یان خووی ژیانی نێو ئاوی دەریاوە.

**دریاسالار** / daryāsālār ، ـان/: اسم. دەریاسالار؛ سەرکردەی هێزی دەریایی. هەروەها: **دریاسالاری**

**دریافت** / daryāft ، ـها/: اسم. وەرگرت؛ گرت؛

وەرگـــری: ١. کـــار یـــان ڕەوتی وەرگـــرتن؛ گورەتەنـە. بەرانبـەر: **پرداخـت** ‹دریافت حقوق: وەرگری مووچە› ٢. کار یان ڕەوتی وەرگرتن؛ بـە دەست هێنان ‹کتاب را دریافت کردم: کتێبەکـەم وەرگـرت› ٣. ئـاوەز؛ دەرک؛ فـام ٤. *[حسابداری]* وەرگیراوە؛ ئەوی کـە گـیراوە یـان ئـەگیردرێ. بەرانبـەر: **پرداخـت** ‹دریافتهـای سـال جـاری: وەرگیراوەی ئەمساڵ›.

▣ دریافت شدن: ١. وەرگیران؛ گیران؛ سـەنران ‹از هر نفر صد تومان دریافت می‌شود: لە هەر کەسێ سـەد تمـەن وەردەگیردرێت› ٢. دیـار بـوون؛ تێگەیشتن؛ حاڵی بوون ‹از حرفهای شما دریافت می‌شود که موافق نیستید: لـە قـسەکانتاندا وا دیـارە کە ڕازی نین›.

دریافت کردن: وەرگـرتن؛ گورەتەنـە؛ گـرتن؛ گێرتـەی: ١. سـاندن؛ ئەسـتاندن؛ هلانـین ٢. حاڵی بوون؛ تێگەیشتن؛ ئەنەیاوەی.

**دریافت‌کننده** / daryāftkonande ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* وەرگر؛ ئەوی کە شتێ (وەک نامە یان پارە) وەردەگـرێ یـان دەبـێ وەربگـرێ ‹امـضای دریافت‌کننده ضروری است: واژۆی وەرگر پێویستە›.

**دریافتن** / daryāftan/: *مصدر. متعدی.* // **دریافتی:** تێگەیشتی؛ **درمی‌یابی:** تێدەگەی؛ **دریاب:** تـێبگـە// ١. تێگەیشتن؛ حاڵی بوون؛ زانـین؛ ئەنـەیاوەی؛ یاواینە ٢. دەسکەوتن؛ بە بار یـان چۆنیەتیـەک گەیشتن ٣. *[نامتداول]* وەرگرتن؛ گرتن؛ گێرتەی؛ هلانین. هەروەها: **دریافتنی**

■ مصدر منفی: **درنیافتن** (تێنەگەیشتن)

**دریـــافتی**[1] / daryāftî ، ـهـا/: *اسم.* وەرگـرتی؛ گـرتی؛ وەرگـیراوە؛ دەسـکەوتوو؛ ئـەوەی کـە وەرگیراوە یان وەردەگیرێت ‹دریـافتی شـما چقـدر است؟: وەرگیراوەی ئێوە چەندە؟›.

**دریافتی**[2]: *صفت.* وەرگیراو ‹پول دریافتی را بشمارید: پارە وەرگیراوەکە بژمێرن›.

**دریاکنار** / daryākenār/: *اسم.* زرێبـار؛ زرێـوار؛ زرێپەڕ؛ ڕۆخ؛ ڕەخ؛ بەر دەریا؛ بەسـتێن؛ بـەراف؛ دەریادەر؛ لێواری دەریا؛ جێگایێ کـە لـە کـەنار دەریاوەیە.

**دریانورد** / daryānavard ، ـها؛ ـان/: *اسم.* زریڤان؛ دەریاوان؛ کەسێ کە کاری دەریاوانیە.

**دریانوردی** / daryānavardî/: *اسم.* دەریـاوانی: ١. /ـها/ سەفەر لـە دەریـا بەتایبـەت ئاژوانـدنی گەمیـە یـا خـۆ بەشـداریکـردن لـەو کـارەدا ٢. زانـستی بـەڕێوەبردنی کەشـتی، بەتایبـەت شێوەی ناسینی بار و دۆخ، جێگا، مەودا و ڕێگا.

**دریایی** / daryāyî/: *صفت.* دەریـایی؛ زەریـایی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە دەریـاوە ‹آب و هـوای دریایی: ئاو و هەوای دەریایی› ٢. خاوەن ژیـان لـە نێو دەریـادا ‹جانور دریـایی: ژینـەوەری دەریـایی› ٣. پێوەندیدار یان سـەر بـە دەریاوانیـەوە ‹سفر دریـایی؛ نیروی دریـایی: سـەفەری دەریـایی؛ هێـزی دەریایی› ✽ **دریائی**

**دریبـــل** / dirîbl,derîbl ، ـهـا/: [انگلیـسی] *اسم.* *[ورزش]* دریبل؛ دریب؛ کاری ڕفانـدنی تـۆپ بـە لێزانی.

**دریچه** / darîče ، ـها/: *اسم.* دەریـژە؛ دەربیچـە؛ دەریچە: ١. دەلاقە؛ هۆرتمە؛ درگایەکی چکۆلـە لە دیوار یان میچدا کە ڕۆچنەیـەک دادەپۆشـێ ٢. کوناوەجە؛ کوناوانجە؛ کوناباجە؛ کولاوڕۆچنە؛ کولەک؛ ڕۆچنـە؛ بانجـە؛ قـولێر؛ ڕۆچنـەیێ کـە ئـامێرێکی بـۆ کردنـەوە و پێـوەدان پێوەیـە ٣. *[کالبدشناسی]* پێکهاتەیەک لە بـڕێ ئەنـدامانی دەروونی لەش، بەتایبەت لە سەرەڕێی ڕەگدا کە بۆ تاوێ ڕۆگە یان کەلێنێ دەبەستێ و چۆنیەتی هاتوچۆی تراو (بەتایبەت خوێن) دابین دەکا.

▣ دریچـــەی اطمینـــان: دەریـــژەی هـــەداری؛ دەریچـــەی دڵـــنیایی؛ پێکهاتەیـــەک لـــە ماشین‌گەلی هەڵـمیدا کـە لـە کـاتی پـەنگ خواردنەوەی هەڵم، بە شێوەی خۆمـەش بـاز دەبێ و هەڵمەکە دەردەدا.

**دریدگی** / darîdegî ، ـها/: *اسم*. ۱. دڕاوی؛ دڕیایی؛ دڕیاگی؛ شڕ و لەتی؛ شڕ بە هۆی دڕانەوە ‹دریدگی پیراهن: دڕاوی کراس› ۲. *[مجازی]* بێشەرمی؛ بێحەیایی؛ کوڵەشی؛ بەڕوویی؛ ڕووداماڵیاگی؛ ڕووهەڵماڵیاوی؛ شەرمتکاوی؛ گۆسارتمەیی؛ سێبەندیی؛ بێچاو و ڕوویی؛ بەقلیسۆکی؛ کەلپزایی؛ قوڵتەشی؛ قوڵتەشەیی؛ ڕووقایمی؛ قرشماڵی؛ دەلوقەلی ‹آدم بە این دریدگی و بی‌چشم‌ورویی دیده بودی؟: کەسی بەم بێشەرمی و بێچاوڕۆییەت دیتبوو؟›.

**دریدن** / darîdan/: *مصدر. متعدی.* // **دریدی**: هەڵتدڕی؛ **می‌دری**: هەڵدەدڕی؛ **بدر**: هەڵدڕە// هەڵدڕین: ۱. دڕین؛ دڕوون؛ دڕاندن؛ دڕانن؛ دڕنەی؛ دڕنای؛ دڕیەی؛ دادڕین؛ دادڕاندن؛ شڕکردن؛ لەتکردن؛ فەرژاندن؛ فەکاندن؛ بزڕاندن؛ چڕاندن؛ پەڕتاندن؛ گەزخاندن؛ ڕنای؛ لەتوپەتکردنی شتێک لە تووڕەیی و ڕک یان بە زۆر و گوشار ۲. هەڵدڕین؛ هۆردڕیەی؛ لەتوپەتکردن؛ گەزەن گەیاندنی گیانداریکی (زۆرتر) کێوی بە گیانداریکیتر و تەنانەت کوشتنی ‹شیر آهو را درید: شێر ئاسکەکەی هەڵدڕی›. هەروەها: **دریدنی**

■ صفت فاعلی: **درنده** (هەڵدڕ)/ صفت مفعولی: **دریده** (هەڵدڕاو)/ مصدر منفی: **نَدریدن** (هەڵنەدڕین)

**دریده** / darîde ، ـها؛ ـگان/: *صفت*. ۱. *[مجازی، گفتاری]* قوڵتەش؛ قوڵتەشە؛ کوڵەش؛ بێشەرم؛ بێحەیا؛ بەڕوو؛ ڕووداماڵیاگ؛ ڕووهەڵماڵیاو؛ شەرمتکاو؛ گۆسارتمە؛ سێبەندی؛ بێچاو و ڕوو؛ بەقلیسۆک؛ کەلپزا؛ ڕووقایم؛ قرشماڵ؛ دەلوقەل ‹زنیکەی دریده خجالت نمی‌کشید: ژنەتیوی قوڵتەش شەرمی نەدەکرد› ۲. دڕاو؛ دڕیاو؛ دڕیاگ؛ دڕیا؛ شیپاڵ؛ شیتاڵ؛ شڕکراو ‹جامەی دریده: جلکی دڕاو›.

**دریغ**[1] / darîq/: *اسم. [ادبی]* داخ؛ ئاخ؛ مخابن؛ مەخابن؛ خەبینەت؛ ئاخوداخ؛ هاوار؛ یازوخ؛ یازوغ؛ دڕێخ؛ دڕێغ؛ هایلۆ؛ داخ و حەیف؛ ئەوەی کە نەبوونی، بەتایبەت لە دەست دانی، دەبێتە هۆی داخ و کوڵ و کەسەر ‹دریغ از راه دور و رنج بسیار: داخ لەو ڕێگا دوورە و لەو هەموو ئەرکە›.

▣ **دریغ از چیزی**: داخ بۆ شتێک؛ ئاخ بۆ شتێک؛ داخ پەی چێوێوی/ چێویە؛ ئاخ هەڵکێشان بۆ نەبوونی شتێک ‹دریغ از یک مرد؛ دریغ از یک وجب خاک: داخ بو پیاویک؛ ئاخ بو بستی خاک›.

▣ **دریغ بودن**: مخابن بوون؛ جێی داخ بوون؛ حەیف بوون؛ یاگۆ داخێ بیەی.

**دریغ داشتن/ کردن**: دڕێخکردن؛ ڕجوا نەدیتن؛ شتێک نەدان.

**دریغ گفتن**: ئاخ و داخ کردن؛ خەمی لە دەست چوویەک خواردن.

**دریغ**[2] ☜ **دریغا**

**دریغا** / darîqā/: *صوت. [ادبی]* داخەکەم؛ داخم؛ داخەم؛ بە داخەوە؛ داخ و دەرد؛ دەردۆ؛ وەیڕۆ؛ ئەیداخ؛ بە داخەوە؛ مخابن؛ موخابن؛ ئەی مخابن؛ داخ و عەزرەت؛ هاوار بە ماڵم؛ وشەیەک بۆ دەربڕینی خەم و کەسەر لە ڕووداوێک ‹دریغا تاب و نیروی جوانی: داخەکەم بۆ گوڕ و تینی جوانی›: **دریغ**[2]

**دریل** / dereyl ، ـها/: [انگلیسی از هلندی] *اسم*. ۱. دریڵ؛ سمۆ؛ بەریمە؛ ئامێرێک بۆ کونکردن، کە زۆرتر بە کارەبا کار دەکا ۲. مەتە؛ مەتێ ***دڕل** *[گفتاری]*

**دری ــ وری** / darîvarî ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* هەڵیتوپەڵیت؛ حەلەق ـ مەلەق؛ قسەی قۆڕ؛ وتەی بێناوەرۆک ‹این دری ــ وریها چیست کە می‌گویی؟: ئەم هەڵیت و پەڵیتانە چیە دەیڵێی؟›.

**دریوزگی** / daryûzegî ، ـها/: *اسم. [ادبی]* سواڵکەری؛ دەرۆزەکەری؛ گەدایی؛ گەدایێ؛ خوازەڵۆکی: **دریوزەگری؛ دریوزە**

**دریوزه** / daryûze/ ☜ **دریوزگی**

**دریوزه‌گری** / daryûzegarî/ ☜ **دریوزگی**

**دز** / doz/: [فرانسوی]/اسم. دۆز؛ فەرەک؛ فەرک؛ هەندی کارا یان بەرایی دراو لە دەوا بۆ ژەمێ: **دۆز**

**دزد**[1] / dozd، ـها؛ ـان/: اسم. دز؛ مالبڕ؛ قەرەپشی؛ شەوکوت؛ چاپ؛ ئەبابۆز؛ دزۆکەر؛ کەسێ کە مالی مەردم بە نهێنی و بێ ئاگایان دەبا ‹دزد نگرفته پادشاه است: دزی نەگیراو پاشایە›.

▣ دزد دریایی: [قدیمی] دزی دەریایی؛ کوسار؛ چەتەی دەریا؛ کەسێ کە لە هێرش بردن و دزینی گەمیە و پیتەوایدا بەشدارە.

دزد سرگردنه: ۱. ملەگر؛ دزی سەر کەل؛ چەتەی ملە ۲. [کنایی] دزی ڕۆژی ڕۆشن؛ دزێ کە بەبێ ترس و بە ئاشکرا دزی دەکا.

دزد ناموس: [مجازی] دزەناموس؛ فاسق؛ پیاوێ کە لەگەل ژنی پیاوێکیتر کەین و بەینی هەیە.

▣ دزد بردن: دز بردن؛ دز برن؛ دزبەردەی؛ دزران؛ دزیان ‹دار و ندارم را دزد برد: دار و نەدارم دز بردی›.

دزد زدن: دز لێدان؛ دز بردن؛ دز برین؛ دز دە ونەی؛ دەستی دز گەیشتنە شوێنێ یان شتێک ‹خانەام را دزد زد: دز دای لە مالم›.

دزد گرفتن: دزگرتن؛ دزگیرتەی؛ قۆلبەس کردنی دز.

**دزد**[2]: صفت. دز؛ خاوەن هۆگرەتی بە دزی‌کردن ‹شاگرد دزد بە درد من نمی‌خورد: شاگردی دز بە کەلکی من نایە›. هەروەها: **دزد بودن؛ دزد شدن**

**دزدافشار** / dozdafšār/: اسم. [نامتداول] دزدەسەک؛ دزدەستەک؛ شەریکەدز؛ دەسکیس؛ هاریکاری دز.

**دزدانه**[1] / dozdāne/: صفت. بە دزیەوە؛ بە دزی؛ نهێنی؛ لە ژێرەوە؛ پەنامەکی وەکوو دزان ‹نگاه دزدانه: ڕوانینی بە دزیەوە›.

**دزدانه**[2]: قید. بە دزیەوە؛ بێدزی؛ وە دزیەکەو؛ بێدزهی؛ بە نهێنی؛ ب دزیڤە؛ بەبێ ئاوڕدانەوە و ئاگاداری دیترانەوە ‹دزدانه سرک کشیدم ببینم چه خبر است: بە دزیەوە ڕوانیم بزانم چ باسە›.

**دزدبازار** / dozdbāzār/: اسم. دزخانە؛ دزبازاڕ؛ شارەدز؛ جێگایەک کە دزی زۆری لێیە.

**دزدکی** / dozdakî/: قید. بە دزیەوە؛ بە دزەدز؛ بێ‌دزی؛ بێ‌دزەی؛ بە دزیەکەوە؛ وە دزیکەو؛ خنز؛ بە نهێنی؛ لە بنەوە ‹دزدکی از پنجره نگاه کردم: بە دزیەوە لە پەنجەرەکەوە ڕوانیم›.

**دزدگاه** / dozdgāh، ـها/: اسم. دزکۆشکە؛ دزکۆژگە؛ مۆلەدز؛ کولانەدز؛ مەکۆی دزان؛ جێگای کۆوە بوونی دزان ‹محلەی ما شده بود دزدگاه: گەڕەکی مە ببووە دزکۆشکە›.

**دزدگیر** / dozdgîr، ـها/: اسم. دزگیر؛ دزگر؛ ئامێرێکی کارەبایی یان ئیلکترۆنیکی کە بۆ بەرگری لە دزی دادەنرێ و بە زریکاندن یان ڕۆشن کردنی چرا هاتنی کەس یان کەسانێ تازە خەبەر دەدا ‹دزدگیر را از کار انداخته بودند: دزگیرەکەیان لە کار خستبوو›.

**دزدی**[1] / dozdî، ـها/: اسم. دزی؛ چرپ؛ تالان و بڕۆ؛ کارەڕەهاتی بردنی مالی دیتران بەبێ ئاگاداریان.

▣ **دزدی ادبی**: دزی وێژەیی؛ دزی ئەدەبی؛ کارەڕەهاتی بلاوکردنەوەی نووسراوەی دیتران بە ناوی خۆوە.

**دزدی دریایی**: دزی دەریایی؛ دەریاگری.

**دزدی هوایی**: فڕۆکەڕفێنی؛ فڕۆکەدزی.

▣ **دزدی رفتن**: چوون بۆ دزی؛ بۆ دزی ڕۆیشتن ‹رفته بود دزدی، گیر افتاد: چووبوو بۆ دزی، وەگیر کەوت›.

دزدی کردن: دزی‌کردن؛ دزی‌کەردەی.

**دزدی**[2]: صفت. دزیەتی؛ دزی؛ دزراو ‹رادیوی دزدی خریده بود: ڕادیۆی دزیەتی کڕیبوو›.

**دزدیدن** / dozdîdan/: مصدر. متعدی. // **دزدیدی:**

دزیـت؛ **می‌دزدی:** دەدزی؛ **بدزد:** بـدزە// ١. دزیـن؛ دزیەی؛ ڕواکانن؛ چرپانن؛ شتێک بە نهـێنی بـۆ خـۆ بـردن ‹مـال کـسی را دزدیـدن: مالـی کەسـێک دزین› ٢. *[مجازی، گفتاری]* دزینەوە؛ ئەوەدزیـەی؛ دزیەیوە؛ پەنادان؛ شاردنەوە؛ حەشاردان؛ لادان و پەنادانی خۆ یان ئەندامێکی لەش بۆ نـەبینران و خـۆ پاراسـتن ‹سـرت را بـدزد: سـەرت بـدزەوە›.
هەروەها: **دزدیدنی**

■ صـفت مفعـولی: **دزدیـده** (دزراو)/ مـصدر منفـی: **نَدزدیدن** (نەدزین)

**دزدیده**[1] / dozdîde/: *صفت. [گفتاری]* بە دزیەوە؛ بێ‌دزی؛ وە دزیکەو؛ نهێنی ‹نگاه دزدیده: ڕوانـینی بە دزیەوە›.

**دزدیـده**[2]: *قیـد. [گفتـاری]* بـە دزیـەوە؛ بـێ‌دزی؛ بێ‌دزەی؛ وە دزیکەو؛ بە نهێنی؛ بەبێ سـەرنج و ئاگـاداری دیترانـەوە ‹دزدیـده رفـتن: بـە دزیـەوە ڕۆیشتن›.

**دزمتر** / dozmetr ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* دۆزمیتر؛ دۆزیمیتـــر؛ ئـــامێری پێـــوانی ڕادەی لێـــدانی پرشنگی ناوکـەیی لـە مـرۆڤ یـان شـتێک لـە ماوەیەکی دیاریکراودا: **دُزیمتر**

**دزنفکتـــــه** / dezanfekte/: [فرانـــسوی] صـــفت. ١. پاکژکراو؛ پاقژکراو؛ خاوێن‌کراوە؛ دژگەنی‌کراو ٢. لـهـا//*[مجـازی، تعـریض]* وەسـواس؛ سـوور و دڵدانەمەزراو لـە سـەر خـاوێنی ‹خیلـی دزنفکتـه تشریف دارید: زۆر وەسواسی›.

**دزیمتر** / dozîmetr/: [فرانسوی] ☜ **دُزمتر**

**دژ** / dej ، ـها/: [از کردی]/*اسم.* دژ؛ دوژ؛ کەلەهـ ؛ کەلەمە؛ کرۆکە؛ کەلات؛ قەڵا؛ خانووبەرەیێک بە جێگا و کەلپەلی پێویست بـۆ مانـەوەی هێـزی چەکداری و بە تایبەتمەندی بەرگری لە هێرشی دوژمن.

**دژ ـ** / doj, dej/: *پیشوند.* دژـ ؛ بەدـ ؛ خـراپ ‹دژآهنگ؛ دژخیم: دژئاهەنگ؛ دژهێم›.

**دژآهنـــــگ** / dojāhang/: *صـــفت. [ادبـــی]* ١. دەنگ‌ناخۆش؛ دژئاهەنگ؛ خاوەن دەنگی قۆڕ ٢. دڵپیس؛ خاوەن دەروون و نیەتی خراپ.

**دژبان** / dejbān ، ـها؛ ـان/: [از کردی/ فارسی]/*اسم.* دژوان؛ دژبان؛ دژدار؛ داژدار؛ قەڵادار؛ قەڵاتەوان.

**دژبانی** / dejbānî ، ـها/: [از کـردی/ فارسـی]/*اسم.* دژوانی؛ دژبانی: ١. مەزرینگەیەک لـە ئەرتـەش بۆ چاودێری کـرداری سـەربازان و بـەڕێوەبردنی قانوون لـە هێـزی چەکداریـدا ٢. قەڵاتـەداری؛ قەڵاتەوانی؛ دژداری؛ کاری دژبان.

**دژپیه** / dojpîh/: *اسم.* لۆبەز؛ لکی چەوری کە لە بەشێکی جەستەدا دەردێت: **دُشپِل**

**دژخیم** / dejxîm ، ـها؛ ـان/: [از کردی]/*اسم. [ادبی]* ١. جـەلاو؛ جـەلاد؛ کەسـێ کـە ئیعدامیگـەل دەکـوژێ ٢. *[مجـازی]* دژهـێم؛ کەسـێ کـە زۆر بێ‌بەزەیی و ئازاردەرە ‹او یک دژخیم به تمام معنـی بود: دژهیمێکی بەڕاستی بوو› ✽ **جلاد**

**دژم** / dojam, dejam/: *صـفت. [ادبـی]* ١. گـژم؛ گرژ؛ چرچـە؛ تـووڕە و زیـز ‹چهـرەای دژم داشـت: نژمێکی گژمی بوو› ٢. تووڕە؛ گرگین ٣. *[مجـازی]* نالـەبار؛ نابـار؛ خـراپ؛ ناسـاز؛ بـەد ‹روزگـار دژم: ڕۆژگـاری نالـەبار› ٤. *[مجـازی]* ژاکـاو؛ پـەژمراو؛ دەژیا.

**دسامبر** / desām(b)r/: [فرانسوی]/*اسم.* دیـسامبر؛ کانوونی یەکەم؛ دوایین مانگی سالی زایینی کە ٣١ ڕۆژە و لە ١٠ی سەرماوەزەوە دەس پێدەکا.

**دسایس** / dasāyes/: [عربی] جمعِ ☜ **دسیسه**

**دســــپوتیزم** / despotîzm/: [فرانـــسوی] ☜ **دِسپُوتیسم**

**دسپوتیـــسم** / despotîsm/: [فرانـــسوی]/*اســـم.* حکوومـەتی ملهوڕانـە؛ حکوومـەتی زۆرەملانـە: **دسپوتیزم**

**دست** / dast ، ـها؛ ـان/:/*اسم.* ١. دەسـت؛ دەس؛ لـەپ؛ ئەنـدامی بـەرووی زۆرتـری گوهانـداران، بەتایبەت مرۆڤ، کە لە باهۆ، ئانیشک، مەچـەک و لەپ و قامکان پێکهاتووە ٢. *[گفتـاری]* دەسـت؛

دەس؛ لا؛ سۆ؛ لایەن ‹دست راست: دەستی ڕاست› ۳. دەست؛ دەس؛ کۆمەڵەیەکی تەواو لە شتێک ‹یک دست میز و صندلی: دەستێ مێز و سەندەڵی› ٤. دەست؛ دەس؛ سەرە؛ گە؛ جار؛ ڕا؛ کەڕەت ‹سه دست بازی کردیم؛ دو دست سرم را شستم: سێ دەست کایەمان کرد؛ دوو دەس سەرم شت› ٥. دەستە؛ دەسە؛ جۆر؛ چەشن ‹از این دست آدمها همه جا پیدا می‌شود: لەم دەستە بنیادەمانە لە هەموو جێگایەکدا هەیە› ٦. دەست؛ دەس؛ دارایی و خاوەنداریەتی ‹در دست داشتن: لە دەستدا بوون› ۷. *[مجازی]* دەست؛ دەس؛ بەشداری ‹توی این کار دست دارد: لەم کارەدا دەستی هەیە› ۸. یەکەی ژماردنی هەندێک شت (وەک جلوبەرگ، بڕێک لە چێشتان، ساختومان، پەلەوەران، بەتایبەت پەلەوەرانی ڕاوکەر) ۹. *[مجازی، گفتاری]* یار؛ یاوەر.

**دست آخر**: دەرئەنجام؛ دەرەنجام؛ سەرەنجام؛ ئاخری؛ دوایی؛ دواخری؛ دمایی؛ ئاخرجار؛ دواجار؛ جاری ئاخر ‹دست آخر داداشم برنده شد: دەرئەنجام کاکم بردیەوە›.

**دست از پا درازتر**: *[مجازی]* دەس لە پێ درێژتر؛ دەست لە گونان درێژتر؛ دەم لە پووش؛ سەرنەکەوتوو؛ ناکام ‹دست از پا درازتر برگشت و گفت، نانوایی بسته بود: دەست لە پێ درێژتر گەڕایەوە و گوتی، نانەواخانە بەسرابوو›.

**دست اول** ☜ **دست‌اول**

**دست بالا** ☜ **دست‌بالا**

**دست برقضا**: بە هەڵکەوت؛ وە هەڵکەفت؛ بە ڕێکەوت؛ خۆوبەختی.

**دست به‌نقد** ☜ **دست‌به‌نقد**

**دست چپ**: دەستی چەپ؛ دەس چەپ: ۱. دەستێ کە لە لای چەپی جەستەوەیە ۲. لای چەپ؛ دەسوو چەپی.

**دست چپی**: ۱. دەستی چەپی؛ دەس چەپی؛ ئەوەی کە لە لای چەپەوەیە ۲. *[سیاسی]* لانەخواز؛ چەپخواز؛ خوازیاری ئاڵوگۆڕ لە پێوەندی و بنەماگەلی کۆمەڵایەتی بە قازانجی کۆمای خەڵک و ئازادی زۆرتریان.

**دست خالی**: دەستی خاڵی؛ دەس خاڵی؛ دەسی هاڵی؛ بەبێ پارە و ئامێری پێویست ‹آن خانه را با دست خالی ساخت: ئەو ماڵەی بە دەستی خاڵی کردەوە›.

**دستِ دوم** ☜ **دست‌دوم**

**دست راست**: دەستی ڕاست؛ دەس ڕاس: ۱. دەستێ کە لە لای ڕاستی جەستەوەیە ۲. لای ڕاست؛ دەسوو ڕاسی.

**دست راستی**: *[سیاست]* پاوان‌خواز؛ لایەنگری ڕاگرتنی پێوەندی و بنەماگەلی کۆمەڵایەتی کۆن یا گەڕانەوە بۆ سەر ئەوانە.

**دستِ کم** ☜ **دست‌کم**

**دست آوردن**: باش هێنان؛ دەستی باش هێنان؛ خاس هاوردن؛ لە کایەی وەرەقاندا دەستێکی باش بۆ هاتن.

**دست از آستین درآوردن**: *[ادبی]* قۆڵ هەڵماڵین؛ خۆ لێ هەڵکردن؛ ئامادەیی، دەرفەت یان ئازایی بۆکارێ پەیدا کردن.

**دست از پا خطا نکردن**: *[کنایی]* موو نەپساندن؛ لە پێستی خۆدا نەجوولان؛ پا لار دانەنان؛ هیچ کارێکی خراپ نەکردن ‹بعد از آن دیگر دست از پا خطا نمی‌کرد: دوای ئەوە ئیتر پای لاری دانەدەنا›.

**دست از جان شستن**: *[مجازی]* دەست لە گیان بەردان؛ دەس لە گیان داشۆردن؛ گاندێ کەوتش؛ ئامادەی مەرگ بوون ‹دست از جان شست و خودش را به پایین پرتاب کرد: دەستی لە گیانی بەردا و خۆی خستە خوارەوە›.

**دست از چیزی شستن**: *[مجازی]* دەست لە شتێ بەردان؛ دەس لە شتێ داشۆردن؛ هیواداری بە شتێک نەمان و بە دوویدا نەچوون.

**دست از چیزی کشیدن:** *[کنایی]* دەس لە شتێ بەردان؛ دەست لە شتێک کێشانەوە؛ دەس لە شتێ کێشان؛ وێڵ کردن ‹دست از کار کشید: دەسی لە کار بەردا›.

**دست از سر کسی برداشتن:** *[کنایی]* لە کۆڵ کەسێک بوونەوە؛ لە مل کەسێ بووونەوە؛ واز لە کەسێ هێنان؛ دەس هەڵگرتن لە ئازاری کەسێک ‹دست از سر برادرت بردار: لە کۆڵ براکەت ببەوە›.

**دست افشاندن:** *[ادبی]* دەست ڕاتەڵەکاندن؛ دەست تەکان‌دان؛ دەست ڕاوەشاندن؛ دەس/ دەست هەڵتەکاندن: ١. بە نیشانەی خۆشی دەست نیشاندان ٢. دەست ڕاداشتن؛ بە نیشانەی بە جێ هێشتنی شتێک، دەست تەکان دان.

**دست انداختن:** ١. *[مجازی]* سەر نانە سەر؛ کردنە گەپجاڕ ‹بچه‌ها آزاد را دست انداخته بودند: کوڕەکان سەریان نابووە سەر ئازاد› ٢. دەستدرێژی کردن؛ لە دووی بە دەسهێنانی شتێکەوە بوون ٣. دەست خستنە دەور شتێ؛ دەست بۆ شتێک بردن؛ دەست بۆ شتێک درێژکردنەوە یان لە سەر دانان ‹دست انداختم دور گردنش: دەستم خستە دەوری ملی›.

**دست بالا را گرفتن** ☜ **دست‌بالا**

**دست بالا کردن:** *[کنایی]* قۆڵ هەڵماڵین؛ قۆڵ لێ‌هەڵماڵین؛ چۆڵێ هۆرکەردەی؛ ئامادە بوون بۆ ئەنجامدانی کارێک ‹پدر دست بالا کرد و برای آرام زن گرفت: بابە قۆلی هەڵماڵی و ژنی هێنا بۆ ئارام›.

**دست بده داشتن** ☜ **دست چیزی داشتن**

**دست بردار نبودن:** *[مجازی]* دەس هەڵگیر نەبوون؛ دەس‌بەردار نەبوون؛ دەس/ دەست هەڵنەگرتن؛ سوور بوون؛ شێلگیر بوون؛ پێداگر بوون لە سەر کارێک ‹اصرار می‌کرد و دست‌بردار نبود: پێکۆڵی دەکرد و دەس‌هەڵگیر نەدەبوو›.

**دست برداشتن:** *[کنایی]* واز هێنان؛ واز ئانین؛ واز هاوردن؛ واز ئاردەی؛ دەس هەڵگرتن؛ دەس/ دەست لێ‌هەڵگرتن؛ لێ‌گەڕان؛ دەس ئاسەی؛ هلیان؛ لە شتێ یان کارێک چاو پۆشین ‹دیگر از عیاشی دست برداشت: ئیتر وازی لە هەڵەیی هێنا›.

**دست بردن:** ١. دەست لێدان؛ دەست تێ‌بردن؛ بەبێ پرس یان مافێک لە کارێ یان شتێک دەست تێوەردان ‹تو حق نداشتی در نوشتەی من دست ببری: نەدەبوو نووسراوەکەم دەست لێ بدەی› ٢. دەس/ دەست بردن؛ دەس بەردەی؛ دەس بۆ بەرەوە بردن ‹دست بُرد و یک سیب برداشت: دەستی برد و سێویکی هەڵگرت› ٣. *[قدیمی]* دەس/ دەست بردن؛ بردنەوە لە کایەدا.

**دست بر سر کوفتن:** *[کنایی، ادبی]* دانە سەردا؛ ئازیەتباری کردن؛ تازیەباری کردن.

دست بزن داشتن ☜ **دست چیزی داشتن**

دست بگیر داشتن ☜ **دست چیزی داشتن**

دست به آب رساندن ☜ **دست به آب**

**دست به پشت نرفتن:** *[کنایی]* دەست بە شوێنەوە نەبوون؛ دەست لە دوای خۆدا نەهاتن؛ دەست بۆ دوای خۆ نەچوون؛ درگا نەبستن ‹داداش! می‌بینی که هوا سرد است، مگر دست به پشتت نمی‌رود؟ در را ببند!: کاکە! دەزانی ساردە، مەگەر دەستت بە شوێنتەوە نیە؟ دەرکەکە بدەوە!›.

دست به ترکیب چیزی نزدن: دەست لە شتێک نەدان؛ دەست نەبردن بۆ شتێک؛ دەس بە شتێکەوە نەدان؛ دەس بە چێوێوەیەوە نەدەی؛ هیچ گۆڕانێ بە سەردا نەهێنان؛ نەگۆڕانی شتێ.

دست به جایی بند نبودن: *[کنایی]* دەست نەگەیشتن بە کەس یان شتێک؛ دەست بە

جێگایێکەوە گیر نەبوون ‹اگر می‌رفت، دیگر دست من به جایی بند نبود: ئەگەر بڕۆیشتبا دەستم بە هیچ کوێیەک نەدەگەیشت›: **دست به عرب و عجم بند نبودن**

**دست به جیب بردن:** *[کنایی]* دەست بە گیرفاندا کردن؛ دەس کردنە گیرفانا؛ دەس پەی پاخەڵێ بەردەی؛ خەرج کردن.

**دست به جیب بودن:** *[کنایی]* ١. دەست بە دەم گەیشتن؛ خاوەن داهات بوون ٢. دەست و دڵباز بوون؛ دەست نەقووچاو بوون؛ دەست شاش بوون.

**دست به چیزی بردن:** دەست بۆ شتێک بردن؛ بە دەستەوەگرتن یان بە کار هێنانی شتێک ‹یک ماه است دست به کتاب نبرده‌ام: مانگێکە دەستم بۆ کتێب نەبردووە›.

**دست به خون کسی آلودن:** *[کنایی]* دەست چوونە خوێنی کەسێکدا؛ خوێن کردن؛ کەسێک کوشتن.

**دست به دامن کسی شدن:** *[کنایی]* دەسەوداوێنی کەسێک بوون؛ لە کەسێک یارمەتی خواستن ‹آخرش دست به دامن پدرش شد که برایش ماشین بخرد: ئاخری دەسەو داوێنی بابی بوو ماشێنی بۆ بکڕێت›.

**دست به دست دادن:** *[کنایی]* ١. دەست لە دەست نان؛ دەست دانە دەستی یەک؛ دەست بە یەکەوە دان؛ بوونە یەکێک؛ هاودەست بوون؛ یەکانگیر بوون ‹باید دست به دست بدهیم و کار کنیم: دەبێ دەست لە دەستی یەک بنێین و کار بکەین› ٢. دەست بە دەست دان؛ دەساودەس کردن؛ دەس وە دەس دان؛ بە دەستی یەکەوە دان ‹بسته‌ها را دست به دست بدهید تا برسد به نفر آخری: بەستەکان دەست بە دەست بدەن تا بگاتە ئاخر کەس› ٣. دەست نانە ناو دەست؛ دەس نیانە ناو دەس؛ دەستی کەسێک خستنە ناو دەستی کەسێکی ترەوە ‹عروس و داماد را دست به دست دادند: دەستی بووک و زاویان نایە ناو دەستی یەک›.

**دست به دست شدن/ گشتن:** دەست بە دەست بوون/ گەڕان؛ دەساودەس بوون؛ دەس وە دەس بوون؛ لە پێش کەسانی جۆراوجۆردا بوون ‹کتاب آن‌قدر دست به دست شده بود که دیگر جای سالمی نداشت: کتێبەکە ئەوندە دەست بە دەست ببوو تەواو لە کەرەم کەوتبوو›.

**دست به دست کردن:** دەساودەس کردن؛ دەست بە دەست کردن؛ دەس وە دەس کردن: ١. بە دەستی کەسانی جۆراوجۆرەوە دان ٢. *[مجازی]* لە دەستێکەوە بە دەستێکی تر دان ٣. *[کنایی]* سەبر کردن؛ سەور کردن.

**دست به دست هم دادن** ☜ **دست به هم دادن ـ١**

**دست به دل کسی گذاشتن:** *[کنایی]* دەست لە دڵی کەسێک دان؛ دەست لە دەردی کەسێک دان؛ بە دەردی دڵی کەسێک گوێ‌دان ‹دست به دل هر کس بگذاری سر درددلش باز می‌شود: دەست لە دەردی هەر کەسێک بدەی بەری دەردەدڵی دەکرێتەوە›.

**دست به دهن بودن:** *[کنایی]* نان بە دۆ نەگەییشتن؛ نان بە کۆڵی شێرەوە بوون؛ بۆ نانی شەو دامان؛ بە دژواری بژیو پەیدا کردن.

**دست به روی کسی بلند کردن:** *[کنایی]* دەست لە کەسێک بەرزکردنەوە؛ بۆ لێدانی کەسێک دەست هەڵێنان ‹حالا دیگر دست به روی خواهرت بلند می‌کنی؟: ئێستە وات لێهاتووە دەست لە خوشکت بەرز دەکەیەوە؟›.

**دست به سر کردن:** *[کنایی]* دەس بەسەر کردن؛ دەسەسەرکردن؛ گەڕاندنەوە بەبێ وەرامی شیاو.

**دست به سر کسی کشیدن:** دەست بە سەر کەسێکدا هێنان؛ دەس چێوێویەرە ئاردەی؛

کەسێک نەوازشتکردن ‹دست به سر بچه کشید و او را آرام کرد: دەستێکی بە سەر منداڵەکەدا هێنا و هێوری کردەوە›.

**دست به سر و روی چیزی کشیدن:** *[کنایی]* دەست بە شتێکدا هێنان؛ شتێک تەکووز و رێکوپێک کردنەوە ‹اگر دست به سر و روی این خانه بکشی، هنوز قابل سکونت است: ئەگەر دەستێک بە ماڵەکەدا بێنی، ئێستاش بۆ ژیان دەشێ›.

**دست به سر و گوش کسی کشیدن:** *[کنایی]* لاواندنەوە؛ حاواندنەوە؛ لەگەڵ کەسێکدا میهرەبانی کردن.

**دست به سیاه و سفید نزدن:** *[کنایی]* دەست بۆ رەش و سپی نەبردن؛ دەست لە رەش و سپی نەدان؛ دەس وە رەش و چەرمووەو نەدان؛ پووش و بان پووشەوە نەنیان؛ هیچ کارێک نەکردن ‹تازەعروس تا لنگ ظهر می‌خوابید و بعد هم که بلند می‌شد دست به سیاه و سفید نمی‌زد: تازە بووک تا نیوەرۆ دەخەوت و پاش هەستانیش دەستی بە رەش و سپیەوە نەدەدا›.

**دست به سینه ایستادن:** *[کنایی]* گوێڕایەڵ بوون؛ گوێ لە مست بوون؛ بەر فەرمان بوون؛ دەستەونەزەر بوون؛ ئامادەی خزمەت بوون.

**دست به عرب و عجمی بند نبودن** ☜ **دست به جایی بند نبودن**

**دست به عصا راه رفتن:** *[کنایی]* دەست پاراستن؛ پا پاراستن؛ بە دەست کوتانەوە چوون؛ بە دەست ترسانەوە چوون؛ پەلە نەکردن؛ بە هۆش و گۆش بوون؛ بە تەگبیرەوە کارکردن ‹فعلاً باید دست به عصا راه رفت تا از این بحران بگذریم: جارێ دەبێ دەست بپارێزین تا لەم قەیرانە تێپەڕین›.

**دست به فرار کسی خوب بودن:** لە هەڵاتندا ئازا بوون؛ لە دەرچووندا ئازا بوون؛ هەمیشە بۆ دەرچوون تەیار بوون.

**دست به فرمان داشتن:** *[کنایی]* بە دەست و فەرمان بوون؛ شارەزا بوون لە بەڕێوە بردنی ماشیندا.

**دست به قلم داشتن:** *[کنایی]* دەست بە قەڵەم بوون؛ نووسەر بوون؛ لێهاتوو و توانا بوون لە نووسیندا.

**دست به کار شدن:** دەست بە کار بوون؛ دەس/ دەست دانە کار؛ مل پێوەنان بۆ کارێک؛ کارێک دەسپێکردن ‹دست به کار شد و صندلی را درست کرد: دەست بە کار بوو و سەندەڵیەکەی چا کردەوە›.

**دست به گریبان شدن:** چنگاوش بوون؛ بەرەنگار بوونەوە؛ دەستەویەخە بوون؛ ئاوقای یەک بوون؛ تێکگیران؛ گیرانە یەک؛ لێکهالان؛ پەڕەی ڕوە هەنترینیەورە؛ شەڕ کردن: **دست به یقه شدن**

**دست به هم دادن:** ۱. *[کنایی]* یەکگرتن؛ دەست دانە دەستی یەکەوە ‹دست به هم دادند و کار را تمام کردند: بەکیان گرت و کارەکەیان کۆتایی پێهێنا›: **دست به دست هم دادن؛ دست به یکی شدن/ کردن** ۲. ☜ **دست دادن**

**دست به یقه شدن** ☜ **دست به گریبان شدن**

**دست به یکی شدن/ کردن** ☜ **دست به هم دادن ـ۱**

**دست پایین را گرفتن:** لانیکەم گرتن؛ دەستی خوار گرتن؛ لانیکەم دانان ‹تازه او دست پایین را گرفت که این‌قدر شد: تازە لانیکەمیشی گرت کە بوو بەوەندە›.

**دست پیدا کردن** ☜ **دست یافتن**

**دست پیش را گرفتن:** *[کنایی]* دەست خستنە بەر؛ دەست پێش خستن؛ دەست پێش‌کردن؛ دەس وەڵێ وسەی؛ پێشدەستی کردن ‹خودش پول را گم کرده، حالا هم دست پیش را می‌گیرد: خۆی پارەکەی ون کردووە ئیسەیش دەس نەخاتە بەر›.

دست پیش کسی دراز کردن: */کنایی/* دەست لە بەر کەسێک داکێشان؛ دەس پان‌کردنەوە لە بەر کەسێک؛ لە کەسێک شتێک داوا کردن ‹کار کن تا دست پیش مردم دراز کنی: کار بکە با دەست لە بەر خەڵکی دانەکیشی›.

**دست تکدی پیش کسی دراز کردن** ☜ **دست گدایی پیش کسی دراز کردن**

دست تنگ بودن ☜ **دست‌تنگ**

دست تنها بودن ☜ **دست‌تنها**[1]

دست جنباندن: */کنایی/* دەسەواکردن؛ دەس جووڵاندن؛ خۆ هەڵکردن؛ خێراکردن؛ دەس و بردکردن؛ دەسەوە جووڵنەی؛ وەش کەردەی؛ چابک بوون ‹دست بجنبانید! دیر است: دەسەوا بکەن! درەنگە›.

دست چپ و راست خود را نشناختن ☜ **دست راست و چپ خود را نشناختن**

دست چرب خود را به سر کسی کشیدن: */کنایی/* خێر دانەوە بۆ کەسێ؛ خێر بۆ کەسێ دانەوە؛ بەهرە بە کەسێک گەیاندن ‹بلکە دست چربش را به سر ما هم بکشد: بەشکوو خێریکیش بۆ ئیمە بداتەوە›.

دست چیزی داشتن: */مجازی/* دەس/ دەستی شتێک هەبوون؛ لە کارێکدا لێهاتوو بوون: **دست بده داشتن**

دست خود را رو کردن: */کنایی/* مشتی خۆ کردنەوە؛ خۆ دەرخستن؛ پیلانی کارێک (بەتایبەت فریو و تەڵەکە)ی خۆ دەرخستن ‹مجبور شد دست خود را رو کند و بگوید که کارش قاچاق اسلحه است: ناچار بوو مشتی خوی بکاتەوە و بێژێ کە کاری قاچاغی چەکە›.

دست خوردن: دەس لێدران؛ بەبێ خەبەری خاوەنی دەست لە شتێ وەردان ‹کیفش دست خوردە و پولهایش سر جایش نیست: کیفەکەی دەستی لی‌دراوە و پوولەکەی نەماوە›.

دست دادن: دەس دان: ۱. */مجازی/* هەل یان دەرفەتێک ڕەخسان ۲. دەست و مشتاخ کردن؛ دەسەوەدەی؛ تۆقە/ تەوقەکردن؛ مچڕاندن؛ مچڕین؛ بە بۆنەی خێر هاتن یان لە رووی دۆستایەتیەوە دەستی کەسێک گرتن یان گوشین ‹دست دادیم و روبوسی کردیم: دەستمان دا و ماچ و مووچمان کرد›: **دست به هم دادن**

دست داشتن: */کنایی/* ۱. دەست تێدا بوون ‹سارا هم در آن ماجرا دست داشت: ئەو رووداوە ساراش دەستی تێدا هەبوو› ۲. کارامە بوون؛ لێهاتوو بوون ‹در نجاری هم دست داشت: لە نەجاریشدا کارامە بوو› ۳. هاوکار بوون؛ هاودەس و یاریدەر بوون.

دست دراز کردن: ۱. ☜ **دست‌درازی** ۲. دەست/ دەس داکێشان؛ دەس کێشان؛ دەست درێژکردنەوە ‹دست دراز کردم استکان را بردارم: دەستم داکیشا پیاڵەکە هەڵگرم›.

**دست در بغل بودن:** */کنایی/* دەسەپاچە بوون؛ ئەرک و کاری خۆ نەزانین.

**دست درد نکردن:** */کنایی/* دەس/ دەست خۆش بوون؛ دەس وەش بیەی؛ دەس نەیێشان؛ دەس نەڕێزای؛ وتەیەک بۆ پێزانین بە کاری کەسێک ‹دستش درد نکند، زحمت کشید پایەی میز را برایمان درست کرد: دەستی خۆش بێ، زەحمەتی کێشا و پایەی مێزەکەی بۆ چا کردینەوە›.

**دست در یک کاسه داشتن** ☜ **دست کسی با کسی در یک کاسه بودن**

دست ـ دست کردن: */کنایی/* دەسی ـ دەسی کردن؛ دەساودەس کردن؛ دێرکردن ‹آن‌قدر دست ـ دست کردی کە دیر شد: هێندە دەسی ـ دەسیت کرد کەوتە دێر›.

**دست راست و چپ خود را نشناختن:** */کنایی/* دەستی ڕاست و چەپی خۆ نەناسین؛ گون خۆ و گێزەر لێک نەکردنەوە؛ وەکوو منداڵێکی

چکۆلە لە دنیا بێخەبەر بوون ‹تو هنوز دست راست و چپت را نشناختەای، ادعای مردی می‌کنی: تۆ هێشتا دەستی ڕاست و چەپت ناناسی، خوازەی پیاوەتیتە›: **دست چپ و راست خود را نشناختن**

**دست رد به سینەی کسی زدن:** *[کنایی]* دەست بە ڕووی کەسێکەوە نان؛ دەستی کەسێک دانە دواوە؛ داخوازی کەسێک قەبووڵ نەکردن.

**دست روی چیزی گذاشتن:** *[کنایی]* خۆ بەسەر شتێکدا سەپاندن/ داسەپاندن؛ دەست نانە سەر شتێک؛ خۆ بە خاوەنی شتێک دانان یان حەوڵ دان بۆ داگیرکردنی ‹دولت دست گذاشت روی زمینهای بایر: دەوڵەت حوی بە سەر زەوینگەلی بەیاردا سەپاند›.

**دست روی دست گذاشتن:** *[کنایی]* دەست لە سەر دەست دانان؛ پاڵ دانەوە؛ کارێ نەکردن و هیوادار بوون ‹آن‌قدر دست روی دست گذاشت که دیگر وقتش گذشت: ئەوندە دەستی لە سەر دەست دانا کە کاتی بە سەر چوو›.

**دست زدن:** دەست لێدان؛ دەس دە ونەی؛ دەس ئەنەدەی: ۱. دەست پێوەدان؛ دەس پێوە تەقاندن ‹دست نزن، داغ است: دەستی لێ مەدە، داخە› ۲. *[مجازی]* گۆڕانکاری بە چەندیەتی و چۆنیەتی دان ‹کسی به این پولها دست زده؟: کەسێ دەستی لەم دراوە داوە؟› ۳. دەس پێوەدان؛ جێبەجێ کردن ‹دست نزن، بگذار همین جا باشد: دەستی لێ مەدە، بیهێڵە با هەر لێرە بێ› ٤. *[گفتاری]* چەپڵە لێدان؛ چەپ تەقاندن؛ چەپڵەکوەی ‹دست بزنید، عروس می‌خواهد برقصد: دەست لێدەن، بووک دەیەوێ هەڵپەڕێ›.

**دست زیاد بودن:** *[کنایی]* دەس زۆر بوون؛ لە پیشەیەکدا هەڤبەر زۆر بوون ‹امروز در صنعت پلاستیک دست زیاد است و مشتری کم: ئەوڕۆکە لە پیشەی پلاستیکدا دەس زورە و کڕیار کەم›.

هەروەها: **دست زیاد شدن**

**دست زیر بال کسی گرفتن/ کردن** ☜ **زیر بال کسی را گرفتن، زیر**

دست سبک داشتن ☜ **دست کسی سبک بودن**

دست سنگین داشتن ☜ **دست کسی سنگن بودن**

دست شمر/ شیطان را از پشت بستن ☜ **دست کسی را از پشت بستن**

**دست کردن:** دەستکردن؛ دەس کەردەی؛ دەست بردن بۆ شوێنێک یان بە کارێکەوە هەڵپێچان ‹دست کرد توی جیبش و پول درآورد: دەستی کرد بە گیرفانیدا و پووڵی دەرهێنا›.

**دست کسی از چیزی کوتاه بودن:** *[مجازی]* دەستی کەسێک لە شتێک بڕان؛ دەس کەسێ بە چتێک نەگەیین؛ لە بەردەست نەبوونی ئەو شتە بۆ ئەو کەسە ‹حالا که دست پدرت از دنیا کوتاه است: ئێستا کە دەستی بابت لە دنیا بڕاوە›. هەروەها: **دست کسی از چیزی کوتاه شدن**

**دست کسی با کسی در یک کاسه بودن:** *[کنایی]* سەریان لە ئاخوڕێکدا بوون؛ لەگەڵ کەسێکدا هاوپیاڵە بوون/ هاودەس بوون؛ لەیەڵ کەسێک لە کارێدا (زۆرتر ناڕەوا) شەریک بوون ‹اینجا وکیل و وزیر دستشان توی یک کاسه است: لێرەدا نوێنەر و وەزیر سەریان لە ئاخوڕێکدایە›:

**دست در یک کاسه بودن**

**دست کسی باز بودن:** *[کنایی]* دەستی کەسێک ئاوەڵا بوون؛ دەس کەسێ باز بوون؛ بۆ کەسێ لوان؛ بۆ کەسێ دەس دان؛ هەل و دەرفەتی پێویست بۆ کەسێک لەمەڕ کارێکەوە هەبوون ‹دست او باز است و می‌تواند هر کاری برایت بکند: دەستی ئاوەڵایە و دەتوانێ هەموو کارێکت بۆ بکا›.

**دست کسی برکت نداشتن:** *[مجازی]* دەستی

کەسێک بێ‌پیت بوون؛ لە کەسێکەوە بە دیتری قازانج نەگەییشتن ‹یعنی دست من برکت ندارد؟: یانێ دەستی من بێ بەرەکەتە؟›.

**دست کسی بسته بودن:** *[کنایی]* دەستی کەسێک بەستران؛ بێ‌دەسەڵات بوونی کەسێک لەمەڕ کارێکەوە یان بەگشتی نەبوونی هەل یان توانایی ئەنجامدانی کارێک ‹دست من برای استخدام بسته است: دەستم بۆ دامەزران بەستراوە›.

**دست کسی بند بودن:** دەستی کەسێک گیران؛ دەسوو یۆی گیریەی/ گیریای؛ دەستی کەسێک بە کارێکەوە گیر بوون؛ شتێک لە دەستدا بوون یان خەریکی کارێک بوون ‹دستم بند است، در را باز کن: دەستم گیراوە، درگاکە وەکە›.

**دست کسی بودن:** لە دەستی کەسێکدا بوون؛ وە دەس کەسێ بوون؛ بە کەسێ بوون ‹این کار دست من نیست: ئەم کارە لە دەستی مندا نیە›.

**دست کسی به/ توی جیبش نرفتن:** *[کنایی]* ئاو لە دەستی کەسێک نەتکین؛ دانەی گاڵ لە دەستی کەسێک نەوەرین؛ دەستی کەسێ قووچاو بوون؛ ڕژد بوون؛ قرسیچم بوون.
هەروەها: **دست کسی به/ توی جیبش رفتن**

**دست کسی به خون آلوده بودن:** *[کنایی]* دەس کەسێ بە خوێنەوە تلان؛ بکوژ بوونی کەسێک.

**دست کسی به دهنش رسیدن:** *[کنایی]* دەستی کەسێک بە دەمی گەییشتن؛ خاوەن داهات و توانا بۆ ڕابردنی ژین هەبوون ‹شکر خدا دستشان به دهنشان می‌رسد: شوکور بۆ خوا دەستیان دەگاتە دەمیان›.

**دست کسی توی جیب خودش بودن:** *[کنایی]* دەستی کەسێ لە گیرفانی خۆیدا بوون؛ دەستی کەسێک بە دەم خۆوە بوون؛ خاوەن دەسهات و توانایی بۆ سەر بردنی ژیان بوون ‹برای خودش کار می‌کند و دستش به جیب خودش است: بۆ خۆی کاری دەکا و دەستی لە گیرفانی خویدایە›.

**دست کسی چسب داشتن:** *[مجازی]* دەستی کەسێک لار بوون؛ دەستی کەسێک گێڕ بوون؛ دز و نادرووس بوون ‹مواظب باش دست یارو چسب دارد: ئاگادار بە دەستی ئەو کابرایە لارە›.

**دست کسی دراز بودن:** *[کنایی]* دەستی کەسێک داکێشراو بوون؛ ئاتاج بوون؛ نیازمەند بوونی کەسێک ‹دست او دایم پیش مردم دراز است: دەستی هەمیشە بۆ خەڵک داکێشراوە›.

**دست کسی در کار بودن:** *[کنایی]* دەستی کەسێک دەکارێکدا بوون؛ کارێک دەستی کەسێکی تێدا بوون؛ دەستی کەسێک لە ناو کارێکدا بوون؛ دەستێوەردانی ئەو کەسە ‹می‌گویند دست بازاریها در کار است: دەڵێن دەستی بازاریانی تێدایە›.

**دست کسی را از پشت بستن:** *[کنایی]* کەسێک بۆڕ دان؛ لێهاتووتر بوون لە کەسێک.
هەروەها: **دست شمر/ شیطان را از پشت بستن**

**دست کسی را از جایی/ چیزی کوتاه کردن:** *[مجازی]* پێش لە کەسێک برینەوە؛ دەستی کەسێ لە شوێنێ/ شتێ برین.

**دست کسی را باز گذاشتن:** *[کنایی]* بەر بۆ کەسێک شل کردن؛ دەرفەت دان بە کەسێک لە کارێکدا ‹دست او را در مصرف بودجه باز گذاشته‌اند: بۆ خەرج‌کردنی بووجە بەریان بۆ شل کردووە›.

**دست کسی را برگرداندن** ☜ **دست کسی را رد کردن**

**دست کسی را بستن:** *[کنایی]* دەستی کەسێک بەستن/ بەستنەوە؛ هەل و دەرفەتی کارکردن لە کەسێک گرتن ‹قانون دست مرا بسته است و

نمی‌توانم به تو وام بدهم: قانوون دەستی بەستووم و ناتوانم وامت پێبدەم›.

**دست کسی را بند کردن:** *[کنایی]* کەسێک لە سەر کارێک دانان؛ دەس کەسێ بەن کردن؛ دەستی کەسێک لە کارێکدا گیردان ‹اگر می‌توانی دست آزاد را هم بند کن: ئەگەر دەتوانی ئازادیش لە سەر کاری دابنێ›.

**دست کسی را بوسیدن:** *[کنایی]* ۱. بە کەسێک بوون؛ نیازمەندی یارمەتی کەسێک بوون ‹تعمیر پایه‌ی میز دست تو را می‌بوسد: چاکردنەوەی پایەی مێزەکە بە تۆیە› ۲. نیشاندانی بچووکی و خاکەساری لە بەرامبەر کەسێکەوە.

**دست کسی را پس زدن** ☜ **دست کسی را رد کردن**

**دست کسی را توی پوست گردو گذاشتن:** *[مجازی]* دەستی کەسێ نانە کاسە؛ دەست و پێی کەسێک بەستنەوە؛ هەلی کارێک لە کەسێک گرتن ‹پدر عروس دست داماد را توی پوست گردو گذاشته بود: بابی بووک دەست و پێی زاوای بەستبووە›.

**دست کسی را توی حنا گذاشتن:** *[کنایی]* دەستی کەسێک بە زاخدا/ بە ڕۆنی داخا کردن؛ زاخ بۆ کەسێ تاواندنەوە؛ کەسێک تووشیاری گیر و گرفتێک کردن ‹پول را سر وقت نداد و دست مرا توی حنا گذاشت: پارەکەی لە کاتی خۆیدا نەدا و دەستی منی کرد بە زاخدا›.

**دست کسی را خواندن:** *[مجازی]* ناو مشتی کەسێ خوێندنەوە؛ ناو چاوی کەسێک خوێندنەوە؛ بە مەبەست و پیلانی داهاتووی کەسێک زانین ‹دیگر دست او را خوانده بودم و می‌دانستم چه نقشه‌ای دارد: ئیتر ناو مشتیم خوێندبووەوە و ئەمزانی چ پیلانێکی لە ژێر سەردایە›.

**دست کسی را رد کردن:** بە سەر کەسێکدا دانەوە؛ دەس کەسێ دانە دواوە؛ ئەوەی کە کەسێک بیدا لێی وەرنەگرتن: **دست کسی را برگرداندن؛ دست کسی را پس زدن**

**دست کسی را گرفتن:** *[کنایی]* پشتی کەسێک گرتن؛ دەسوو یۆی گێرتەی؛ یارمەتی بە کەسێک گەیاندن ‹وقتی احتیاج داشت دستش را گرفتی؟: لە کاتی نیازیدا پشتت گرت؟›.

**دست کسی رسیدن:** ۱. ☜ **به دست کسی رسیدن** ۲. دەستی کەسێک گەییشتن؛ دەس کەسێ گەیین؛ دەسوو یۆی یاوەی/ یاوای؛ هەل یان دەسڕەس هەبوون ‹اگر دست من به آنجا می‌رسید پاکش می‌کردم: ئەگەر دەستم بەوێ دەگەییشت پاکم دەکردەوە›.

**دست کسی رو شدن:** *[کنایی]* پەتەی کەسێک کەوتنە سەر ئاو؛ دەستی کەسێ ڕوو بوون؛ مشتی کەسێ کرانەوە؛ فێڵی کەسێک دەرکەوتن ‹آخرش دست حسابدار رو شد: سەرەنجام پەنەی حەساودار کەوتە سەر ئاو›.

**دست کسی زیر سر دیگری بودن:** *[کنایی]* دەستی کەسێک بە سەر کەسێکی ترەوە بوون؛ لە هەل و دەرفەت و توانای کەسێک، کەسێکی تریش بەهرەدار بوون.

**دست کسی زیر سنگ بودن:** *[کنایی]* ڕۆژی کەسێک لە جێگایەکی خراپ ئاوا بوون؛ کەسێک تووشیار بوون؛ تووشی گێچەڵ بوونی کەسێک؛ گیر خواردن؛ مزەوەن بوون ‹آن روز که دست من زیر سنگ بود، کمکم کردی؟: لەو ڕۆژەدا کە ڕۆژی من لە جێگایەکی خراپ ئاوا بوو، یارمەتیت دام؟›.

**دست کسی سبک بودن:** *[مجازی]* دەستی کەسێک سووک بوون؛ بە پیت بوون؛ خاوەن دەستێکی قازانجدەر و بەهرەدار هەبوون ‹دست آزاد سبک است، امروز کاسبی خوب می‌شود: دەستی ئازاد سووکە، ئەورۆ بازاڕ باش دەبێ›: **دست سبک داشتن**

**دست کسی سنگین بودن:** دەستی کەسێک

قورس بوون: ۱. خاوەن دەستی بە هێز و توانا بوون ۲. *[مجازی]* خاوەن دەستی زیاندەر هەبوون ‹کسی کە این پیراهن را برید دستش سنگین بود و الآن دو ماه است هنوز تمامش نکردەام: کەسێ کە ئەم کراسەی بڕی دەستی قورس بوو ئەوا دوو مانگە تەواوم نەکردووە› * **دست سنگین داشتن**

**دست کسی کج بودن:** *[کنایی]* دەستی کەسێک لار بوون؛ دەست کەسێ پیس بوون؛ نادرووس و دز بوون ‹دست صندوقدار کج بود، بیرونش کردند: دەسی دەخلدارەکە لار بوو، دەریان کرد›.

**دست کسی/ چیزی ماندن:** بە دەس کەسێ/ شتێکەوە گیر خواردن؛ بە دەستی کەسێ/ شتێکەوە دامان؛ لە کەسێ یان شتێ ماندوو و قەڵس بوون ‹ماندەام دست این همسایەی نفهم: بە دەس ئەم دراوسێ ناحاڵیەوە گیرم خواردووە›.

**دست کسی نمک نداشتن:** *[مجازی]* چاکەی کەسێ لە بەر چاو نەبوون.

**دست کشیدن:** ۱. ☜ **دست از چیزی کشیدن** ۲. دەست پێدا هێنان؛ دەست لێخستن؛ دەس پیا ساوین؛ دەس ئاردەی پۆرەرە ‹دست بکش ببین چە زبر است: دەستی پیدا بینە بزانە چەن زبرە›.

**دست کم گرفتن** ☜ **دستکم**[۲]

**دست کمی نداشتن** ☜ **دستکمی**

**دست گدایی پیش کسی دراز کردن:** لە کەسێ سواڵکردن؛ لە لای کەسێ دەست پان کردنەوە ‹دست گدایی پیش این و آن دراز کردن: لەم و لەو سواڵ کردن›: **دست تکدی پیش کسی دراز کردن**

**دست گرفتن:** ۱. ☜ **بە دست گرفتن ـ۱** ۲. *[کنایی]* گاڵتە پێ کردن؛ تەوس تێگرتن؛ تیز پێ کردن؛ تیتاڵی پێ کردن ‹بچەها آزاد را دست گرفتە بودند و سربەسرش میگذاشتند: کوڕەکان گاڵتەیان بە ئازاد دەکرد و سەریان ئەنا سەری›.

**دست مالیدن:** دەس پێدا کێشان؛ دەست لێدان؛ دەست لێخستن؛ دەس پێدا هێنان؛ دەس ماشەی ‹دست بمالید ببینید زیر قالی چیست: دەستی لیدەن بزانن چی لە ژێر قاڵیەکەدایە›.

**دست نگهداشتن:** دەس ڕاگرتن؛ دەس هێڵانەوە؛ درێژە پێ نەدان؛ وێڵ کردن ‹لازم نیست بروی، حالا دست نگەدار: پێویست نیە بڕۆی، جارێ دەس ڕاگرە›.

**دست و پا زدن** ☜ **دستُوپا**

**دست و پا کردن** ☜ **دستُوپا**

**دست و پنجە نرم کردن:** *[کنایی]* مل بە ملەوە نان؛ شەڕە دندووکێ کردن؛ گێرەوکێشە کردن؛ مل‌ملانێ کردن؛ بە کارێکەوە زۆر خەریک بوون ‹مدتها با کولر دست و پنجە نرم کرد تا درستش کرد: ماوەیەکی زۆر بە کوولێرەکەوە خەریک بوو تا دروستی کردەوە›.

**دست و دل کسی بە کار نرفتن:** *[مجازی]* دەست و دڵی کەسێ یەک نەگرتن؛ دڵی کەسێ بۆ کارێ نەچوون؛ دڵ دانەمەزران لە سەر کارێک؛ دەست و دڵی کەسێ نەچوونە کارەوە؛ هاندەر، حەز و هۆگریەتی بۆ کارێک نەبوون ‹از آن روز دیگر دست و دلش بە کار نمیرفت: لەو ڕۆژەوە ئیدی دەست و دڵی یەکی نەدەگرت›.

**دست و دل کسی سرد/ سست شدن:** *[مجازی]* دەست و پێی کەسێک سارد بوونەوە؛ دەس و پای کەسێ داکێشیان؛ سارد بوونەوە؛ دڵسارد بوونەوە.

**دست یازیدن:** *[ادبی]* دەس بۆ بردن؛ دەس پەی بەردەی: ۱. دەست درێژەوەکردن ۲. *[مجازی]* هەنگاو بۆ هەڵگرتن ‹سە سال پیش بە این کار دست یازیدم: سێ ساڵ لەوە پێش دەستم بۆ ئەم کارە برد›.

**دست یافتن:** دەس کەوتن؛ وەگیرکەوتن؛ بە دەست هێنان؛ خستنە دەستەوە؛ گرتنە دەسەوە؛ وەگیرهێنان؛ دەس‌کەوتەی؛ بە شتێ گەیشتن ‹خیال کرد به گنجی دست یافته است: وای دەزانی خەزێنەیەکی دەست کەوتووە›؛ **دست پیدا کردن**

**از دست دادن:** لە دەست دان ‹سال گذشته پدرش را از دست داد: ساڵی پێشوو باوکی لە دەست دا›.

**از دست در رفتن:** لە دەست دەرچوون: ۱. *[گفتاری]* هەڵاتن؛ ڕاکردن؛ دەسەنە بەرشیەی ‹از دست پلیس در رفت: لە دەستی پۆلیس دەرچوو› ۲. *[مجازی]* دەسەنە ترازیەی؛ کتوپڕ و بێ‌ویست کارێ کردن ‹او به کسی چیزی نمی‌دهد، لابد از دستش در رفته: ئەو شت بە کەس نادا ، دەبێ لە دەستی دەرچووبێ›.

**از دست رفتن:** لە دەس دەرچوون؛ دەسەنە شیەی: ۱. لە دەستەڵات یان دەست دەرچوون؛ لە ژێر دەستەڵاتدا نەمان ‹خانەی به آن بزرگی از دستم رفت: ماڵی وا گەورەم لە دەس دەرچوو› ۲. لە بەین چوون؛ لە کیس چوون ‹هر چه داشت از دستش رفت: هەر چێکی هەبوو لە دەستی دەرچوو› ۳. لە دەس چوون؛ مردن؛ نەمان ‹هفتەی گذشته آن عزیز از دست رفت: حەوتووی ڕابردوو ئەو خۆشەویستە لە دەس چوو›. هەروەها: **از دست دادن**

**از دست کسی برآمدن:** *[مجازی]* کەسێک لە دەستی هاتن؛ لە دەستەڵاتی کەسێکدا بوون؛ توانایی هەبوون ‹از دست عمو برمی‌آید برای ما کاری بکند؟: مامە لە دەستی دێ کارێکمان بۆ بکا؟›.

**از دست کسی درآوردن:** *[کنایی]* لە دەستی کەسێک دەرهێنان؛ لە دەسی کەسێ دەرهاوردن؛ لە چنگ کەسێ دەرێنان؛ بە زۆر و گزیکاری لە چنگ کەسێک کردنەوە ‹باغ را از دست برادرزاده‌اش درآورد: باخەکەی لە دەستی برازاکەی دەرهێنا›.

**از دست کسی/ چیزی عاجز شدن:** لە دەستی کەسێ/ شتێ وەڕەز بوون؛ لە دەستی کەسێ/ شتێ یاس بوون؛ لە دەس کەسێ/ شتێ جاڕز بوون؛ لە کار یان ئاکاری کەسێ (یان شتێک) قەڵس بوون ‹از دست این بچه عاجز شدم: لە دەستی ئەم منداڵە وەڕەز بووم›.

**از دست کسی گرفتن:** لە دەستی کەسێ گرتن: ۱. لێی وەرگرتن ‹پول را از دست مشتری گرفت: پارەکەی لە دەستی کڕیارەکە وەرگرت› ۲. *[گفتاری]* دەستی کەسێ گرتن؛ نەوین لە دەس کەسێ؛ دەسوو یۆی گێرتەی ‹دست پیرمرد را گرفت و بلندش کرد: دەستی پیرەمێردەکەی گرت و هەڵیساند›.

**این دست و آن دست کردن** ☜ **این**[1]

**با یک دست دو هندوانه برداشتن** ☜ **یک**[2]

**به دست آمدن:** بە دەست هاتن؛ هاتنە دەسەوە؛ دەستگیر بوون؛ دەسکەوتن؛ ئامای دەس ‹از فروش قالی چندان پولی به دست نیامد: لە فرۆشی قالیەکە پارەیەکی وا بە دەست نەهات›.

**به دست آوردن:** بە دەست هێنان؛ هاوردنە دەسەوە؛ بە دەس ئاردەی؛ دەست خستن؛ وە چنگ خستن ‹این همه پول را از کجا به دست آوردی؟: ئەم هەموو پارەت لە کوێوە بە دەست هێناوە؟›.

**به دست افتادن:** کەوتنە بەردەست؛ دەست کەوتن؛ کەفتنە دەسەو؛ کەوتەی دەس ‹پولی به دست او افتاد: پارەیەک کەوتە بەردەستی›.

**به دست کسی رسیدن:** بە دەستی کەسێ گەیشتن؛ گەیینە دەس کەسێ؛ یاوایوە دەسوو یۆی ‹برسد به دست برادر عزیزم: بگاتە دەستی برای خۆشەویستم›: **دست کسی رسیدن**. هەروەها: **به دست کسی رساندن**

**به دست کسی نگاه کردن:** *[کنایی]* چاو لە

دەستی کەسێ کردن؛ چاو برینە کەسێ؛ تواشای دەس کەسێ کردن؛ ڕوانینە کەسێکا؛ پەیڕەوی کردن لە کەسێک.

بە دست گرفتن: گرتنە دەستەوە: ۱. دەسپێکردن؛ دەس پنەکەردەی ‹کتاب را تازه به دست گرفته‌ام و دارم می‌خوانم: کتێبەکەم تازە گرتووەتە دەستەوە و خەریکم دەیخوێنمەوە›: **دست گرفتن** ۲. وە ژێر دەستەلات خستن؛ خستنە بەردەست.

در دست بودن ☜ **در**[2]

در دستِ کاری بودن: بە دەستەوە بوون؛ لە دۆخی ئەنجامی کارێکدا بوون ‹بیمارستان در دست ساختمان است: نەخۆشخانەکە بە دەستەوەیە بکرێتەوە›.

روی دست بردن ☜ **رو**[2]

روی دست کسی بلند شدن ☜ **رو**[2]

روی دست کسی ماندن ☜ **رو**[2]

زیر دست کسی بودن ☜ **زیردست**

سر دست بردن ☜ **سر**[3]

یک دست پیش و یک دست پس داشتن ☜ **یک**[2]

**دست‌آموز** / dastāmûz ، ـها/: *صفت.* دەسەمۆ؛ دەستەمۆ؛ ڕام؛ کەوی؛ کەدی؛ تایبەتمەندی گیانداری کە ئۆگری خاوەنەکەی بووە ‹طوطی دست‌آموز؛ میمون دست‌آموز: تووتی دەستەمۆ؛ مەیموونی دەسەمۆ›.

**دست‌ابزار** / dastabzār ، ـها/: *اسم.* ئامراز؛ ئامێر: ۱. کەرەسەیەک کە بە دەست کاری پێ دەکرێ ۲. ئامێری ئەنجامدانی کار * **دست‌افزار**

**دستار** / dastār ، ـها/: *اسم. [ادبی]* ۱. مێزەر؛ مێزەرە؛ مشکی؛ سەروێن؛ سەرپێچ؛ سەرووپێچ؛ پێچومێزەر؛ سەر و شەدە؛ جامانە؛ جەمەدانی؛ جامەدانی؛ ئاغەبانوو؛ ئاغابانوو؛ ڕەشتی؛ کەفینک؛ یالخ؛ یەشماخ؛ یاشماخ؛ شاشک؛ شاشیک؛ شەشک؛ پارچەیەک کە پیاوان بە سەریەوە دەبەستن ۲. پشتێن؛ پشتوێن؛ شاڵ؛ پارچەیەک کە بڕێک بە پشتەوەی دەبەستن ۳. دەسرە؛ دەسرۆک؛ دەسرۆکە؛ دەرسۆک؛ مەندەفە؛ دەسماڵی گەورە.

**دستاس** / dastās ، ـها/: *اسم.* دەستاڕ؛ دەستار؛ دەساڕ؛ دەسیەر؛ هارە؛ هارەکڕ؛ هارەگڵ؛ هارەگلە؛ هارەدەسی؛ کڕە؛ گرک؛ گڕک؛ قەرەک؛ گێرووسە؛ گێرووشە؛ ئاسیاوی دەستی، پێکهاتوو لە دوو پەرەی خڕی بەردین کە لە نێوەڕاستی سەروەکەدا کونێک هەیە بۆ دانە تێکردن و دەسکێکیش بۆ سووڕدانی بە سەر ژێروەکەدا.

**دست‌افزار** / dastafzār/ ☜ **دست‌ابزار**

**دست‌افشار** / dastafšār/: *صفت.* دەسگووش؛ دەستگوشراو؛ کوشراو یان ئاوگیراو بە دەست. بەرانبەر: **پای‌افشار** ‹آبلیموی دست‌افشار: ئاولیمۆی دەسگووش›.

**دست‌افشان** / dastafšān/: *قید. [مجازی]* بە هەڵپەڕکێ؛ لە حاڵی هەڵپەڕکێدا. هەروەها: **دست‌افشانی**

**دستاق** / dostāq, dustāq ، ـها/: [ترکی]/*اسم. [قدیمی]* بەندیخانە؛ گرتووخانە؛ زیندان؛ زینان؛ بەند؛ دوساخ: **دوستاق**

**دستاقبان** / dostāqbān, dustāq- ، ـها؛ ـان/: [ترکی/ فارسی]/*اسم.* بەندیوان؛ زیندانوان؛ دوساخچی: **دوستاقبان**

**دستان** / dastān ، ـها/: *اسم. [ادبی]* ۱. ستران؛ بەستە؛ بەزم؛ ئاهەنگی مووسیقایی ۲. هەڵبەستە؛ داستانێک کە بۆ فریوی دیتران دەگوترێ ۳. فێڵ؛ گزی؛ گرنی؛ هەنگ ٤. پەند؛ مەتەڵ؛ مەتەڵۆک.

**دست‌انداز** / dastandāz ، ـها/: *اسم.* تەسە؛ قۆرت؛ تەگەرە؛ چاڵی و بەرزی ڕێگا.

**دست‌اندازی** / dastandāzî/: *اسم. [مجازی]* دەستدرێژی؛ لەهاندن؛ کار یا ڕەوتی

داگیرکردن یان کەڵک وەرگرتن لە ماڵی کەسانی‌تر.

**دست‌اندرکار** / dastandarkār ، ـان/: *اسم.* دەسبەکار: ١. ئەوی کە خەریک ئەنجامدانی کارێکە ‹از دو ماه پیش دست‌اندرکار تعمیر خانه بودیم: لە دوو مانگ لەمە پێشەوە دەسبەکاری چاکردنەوەی ماڵ بووین› ٢. *[مجازی]* کاربەدەس؛ ئەوی کە لە کارێکدا بەشداره. هەروەها: **دست‌اندرکار بودن**

**دستاورد** / dastāvard ، ـها/: *اسم.* دەسهات؛ دەسکەوت؛ دەسکەفت؛ یاب؛ ئەوەی بە بۆنەی کار یان چالاکیەکەوە بە دەس دێ ‹دستاوردهای علم: دەسهاتگەلی زانست›.

**دست‌اول** / dast(e)'vval ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* نوێ؛ تازە؛ دەستەیەک. بەرانبەر: **دست‌دوم** ‹کالای دست‌اول: کالای نوێ›.

**دستاویز** / dastāvîz ، ـها/: *اسم. [مجازی]* دەساوێز: ١. دەساوێژ؛ چنگاوێژ؛ ئەوی بۆ خوازەی درۆیین یان نادروست بە کار ئەبرێ ‹وصیّت‌نامه‌ای جعلی را دستاویز کرد و مدّعی مالکیت خانه شد: وەسیەتنامەیەکی درۆیینی دەساویز کرد و هەلیکوتایە سەر ماڵەکە› ٢. بیانوو؛ بیانک؛ بەهانە؛ پەڵپ؛ گروو ‹کارگران قطع گاه و بیگاه برق را دستاویز قرار داده بودند و از زیر کار در می‌رفتند: کارێگەرەکان چوونەوەی جارجاری بەرقیان کردبووە بیانوو، خۆیان لە کار ئەدزیەوە›.

**دستباف** / dastbāf/ ☜ **دستبافت**

**دستبافت** / dastbāft ، ـها/: *صفت.* دەستچن؛ دەسچن؛ بە دەست تەنراو، بێ کەڵک‌وەرگری لە ماشین ‹فرش دستبافت: قاڵی دەستچن›: **دستباف** *[گفتاری]*

**دست‌بالا**[1] / dast(e)bālā/: *اسم.* ١. *[مجازی]* بان‌دەس؛ هێز یان پلە و پایەی بانتر ٢. بەراوردی زۆرینە؛ لای سەروو؛ دەسبان.

▣ **دست بالا را داشتن:** لە سەرترەوە بوون؛ هێزی زۆرتر یان دۆخی باشتر هەبوون ‹آن روزها تو در شرکت دست بالا را داشتی: ئەو ڕۆژانە لە بەشدارگەدا تۆ لە سەرترەوە بووی›.

**دست بالا را گرفتن:** *[مجازی]* دەسبان گرتن؛ لانی زۆر گرتن ‹تازه من دست بالا را گرفتم، وگرنه این‌قدر نمی‌شود: تازە من دەسبانم گرت، دەنا ئەوندە نابێ›.

**دست‌بالا**[2]: *قید.* ئەوپەڕی؛ لانی زۆر؛ لای ژوور؛ فرەفرەکەی ‹دست‌بالا دو میلیون می‌ارزد: ئەوپەڕی دوو ملیون دێنێ›.

**دستبرد** / dastbord ، ـها/: *اسم.* دزی؛ دەسدرێژی؛ کار یا ڕەوتی دزینی بەشێ لە پارە یان دارایی کەس یان جێگایەک ‹دزدان دیشب به بانک دستبرد زدند: دزگەل دوێشەو دریبیان کرد لە بانک›. هەروەها: **دستبرد زدن**

**دست‌بردار** / dastbardār/: *صفت.* دەس‌هەڵگر؛ دەس‌بەردار؛ وازهێن ‹هرچه به او گفتم کار دارم، دست‌بردار نبود: هەرچی پێم گوت کارم هەیە، دەس‌هەڵگر نەبوو›.

**دست‌برقضا** / dast(e)barqazā/: [فارسی/ عربی] *قید.* ١. بە هەڵکەوت؛ خواوڕاسان؛ خۆ و بەخت ‹دست‌برقضا آن روز باران می‌آمد: بە هەڵکەوت ئەو ڕۆژە باران ئەباری› ٢. لەپڕ؛ لەپڕا؛ لەپڕ و نەکاو؛ ناکاوە؛ نەکاو؛ ناکا؛ ناگا؛ کوت‌وپڕ؛ گوزوگوم؛ گوزوگومبەت.

**دست‌برنجن** / dastberancan ، ـها/: *اسم. [ادبی]* بازنە؛ خرخاڵ؛ دەسبەند؛ دەسبەنە.

**دست‌بسته** / dastbaste/: *قید.* دەست‌بەسراو؛ دەس بەسیاگ؛ قۆڵبەس؛ بە دەستگەلێ کە بە هۆی بەسراویەوە توانایی جووڵانەوە و کاریان نیە ‹دزد را دست‌بسته تحویل پلیس داد: دزیان دەست‌بەسراو دایە دەستی پولیسەوە›.

**دستبند** / dastband ، ـها/: *اسم.* ١. کەلەبچە؛ کەلەپچە؛ بەلەچەک؛ دەسبەندی بەندی؛ ئامرازێک بە دوو ئاڵقەی ئاسنیەوە، دەستی بەندکراوی پێ‌دەبەستن دەرنەچێت ‹به دستهایش

دستبند زدند و رفتند: کەلەپچەیان دا لە دەستی و چوون›. ۲. بازنە؛ بازنگ؛ بازن؛ خرخاڵ؛ دەستبەند؛ دەسبەند؛ دەسبەن؛ دەسوەن؛ مووچەوانە؛ قوفلک ‹می‌گفتند دستبندش گم شده است: دەیانگوت بازنەکەی گوم بووە›.

**دستبوس** / dastbûs/: *اسم.* ۱. دەس‌ماچکەر؛ دەسبوس؛ دەس‌ڕامووس؛ ئەو کەسە کە بە نیشانەی ڕێزگرتن دەستی کەسێک ماچ دەکا ‹آزاد هم دستبوس است: ئازادیش دەسبوسە› ۲. *[گفتاری]* دەس‌ماچکەری؛ دەسبۆسی؛ دەس‌ڕامووسی؛ کاری دەست ماچ کردن ‹آمدیم دستبوس پدربزرگ: هاتین بۆ دەس‌ڕامووسانی باوەگەورە›.

**دستبوسی** / dastbûsî/: *اسم.* دەسبۆسی؛ دەس‌ماچکەری؛ دەس‌ڕامووسی: ۱. کاری ماچ کردنی دەستی کەسێک ۲. *[کنایی]* ڕەوتی نیشاندانی چکۆلەیی و خاکەساری لەمەڕ کەسێکەوە ‹بندەزادە برای دستبوسی آمده بود، تشریف نداشتید: کوڕەکەم بۆ دەسبوسی هاتبوو، نەبوون›.

**دست به آب** / dastbe'āb/: *اسم. [گفتاری]* ئاودەست؛ دەس‌ئاو؛ دەساو؛ دەست بە ئاو.

▣ دست به آب رساندن: دەست گەیاندنە ئاو؛ چوونە سەر ئاودەس؛ چوون بۆ دەست بە ئاو.

**دست‌به‌سینه** / dastbe sîne/: *صفت. [کنایی]* دەس‌بەسینە؛ دەست‌بەسینە؛ دەستەونەزەر؛ دەست ڤیلک؛ مل‌کەچ و گوێڕایەڵی فەرمان.

**دست به عصا** / dastbe'asā/: [فارسی/ عربی] ☜ دست به عصا راه رفتن، **دست**

**دست‌به‌کار** / dastbekār/ ☜ دست به کار شدن، **دست**

**دست‌به‌نقد**[1] / dastbenaqd/: [فارسی/ عربی] *صفت. [مجازی، گفتاری]* ئامادە؛ تەیار؛ نەخت؛ بەدەستەوە؛ گیف؛ بەرهەڤ ‹کارِ دست‌به‌نقد را می‌گذاری به امید فردا، بشود یا نشود؟!: کاری ئامادە دادەخەی بە ئومێدی بەیانی، ببێ یان نەبێ؟!›.

**دست‌به‌نقد**[2]: *قید. [مجازی، گفتاری]* جاری؛ جارەکان؛ جارێکان؛ ئێستە؛ ئێستا؛ ئێستاکە؛ ئیسێ؛ ئیسە؛ ئایسە؛ نها؛ نهۆ ‹دست به نقد این‌جا را بچسب، اگر جای بهتری پیدا شد، می‌رویم آنجا: جارێ ئێرە بگرە، ئەگەر جێگایەکی چاکتر پەیدا بوو، دەڕۆین بۆ ئەوێ›.

**دستپاچگی** / dastpāčegî/: *اسم. [گفتاری]* هەوڵی؛ دەسەپاچەیی؛ دەستپاچەیی؛ حەپەساوی؛ بەیدەسی؛ پەشێوی سەرچاوەگرتوو لە دۆخ یان ڕووداوێکی ڕەچاو نەکراو کە توانستی کرداری درووس و شیاو لە مرۆ دەستێنێ ‹از دستپاچگی پیراهنم را پشت و رو پوشیدم: لە هەوڵیدا کراسەکەم پێچەوانە لەبەر کرد›.

**دستپاچه** / dastpāče/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* شڵەژاو؛ هەوڵ؛ دەستپاچە؛ دەسەپاچە؛ هڵەپەلە؛ ڕول؛ بەیدەس؛ بەیدەست؛ هەوڵەکی؛ وڵنگە؛ حەپەساو؛ سەر لێ شێواو و هەراسان لە بار و دۆخ یان ڕووداوێکی لە ناکاودا ‹وقتی که پلیس را دید خیلی دستپاچه شد: کاتێ کە پولیسی دیت تەواو شلەژا›. هەروەها: **دستپاچه بودن؛ دستپاچه شدن؛ دستپاچه کردن**

**دستپخت** / dastpoxt/: *اسم.* دەستاو؛ چێشتی لێنراو بە دەستی کەسێک ‹نهار امروز دستپخت عروس خانم است و باید خورد: فراوینی ئەورۆ دەستاوی بووکە نەخشینەیە و ئەشێ بیخۆین›.

**دست‌پرورده** / dastparvarde، ـها؛ ـگان/: *اسم.* بارهاتوو؛ دەستپەروەردە؛ پەروەردەکراو بە دەستی کەسێک یان لە ئاقارێکدا ‹او دست‌پروردەی پدر و مادری معتاد و بی‌سواد است: بارهاتووی دایک و بابێکی موعتاد و نەخوێنەوارە›.

**دست تنگ** / dast.tang/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* کەمدەست؛ کەمدەس؛ تەنگدەست؛ دەستەنگ؛ هەژار؛ نەدار؛ بێ‌ئەنوا؛ دەستوالا؛ دەس‌قالە؛ خاوەن بارەچەی هندک و کەمتر لە ڕادەی پێویست بۆ بە سەر بردنی ژیان ‹این روزها

دست‌تنگ است، باید کمکش کنیم: ماوەیەکە کەمدەستە، دەبێ یارمەتی بدەین›. هەروەها: **دست‌تنگ بودن؛ دست‌تنگ شدن**

**دست‌تنگی** / dast.tangî/: *اسم. [مجازی]* کەمدەستی؛ کەمدەسی؛ تەنگدەستی؛ دەستەنگی؛ هەژاری؛ نەداری؛ بێئەنوایی؛ دەستوالایی؛ دەس‌تەنکی.

**دست تنها**[1] / dast.tanhā/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* تەنیابال؛ دەس‌تەنیا؛ بێ‌ئاریکار؛ بەبێ یاوەر ‹دیروز دست‌تنها بودم چند مهمان هم آمدند: دوێنێ تەنیابال بووم چەند میوانیش هاتن›.

**دست تنها**[2]: *قید.* تەنیابال؛ بە تەنیابالیەوە؛ بە تاقی تەنێ؛ بە تەنیایی؛ دەس‌تەنیا؛ بە تەنیایی و بێ بوونی هاوکار ‹مجبور بود دست‌تنها بچەها را بزرگ کند: ناچار بوو تەنیابال منداڵەکان گەورە بکا›.

**دستجات** / dastecāt/: [فارسی/ از عربی] جمعِ ☜ **دسته**

**دستجمعی** / dastecam'î/: [فارسی/ عربی] ☜ **دسته‌جمعی**

**دست‌چین** / dastčîn ، ـها/: *صفت.* دەسچن: ۱. هەڵبژێردراو بە دەست ۲. *[کنایی]* تەڵبژێر؛ تلژێن؛ تەڵچن؛ هەڵبژاردە؛ تەڵبژێن؛ ناوەژیە ‹بهترین میوەها را دست‌چین کرد و گذاشت توی پاکت: باشترین میوەی دەسچن کرد و خستیە نێو پاکەتەوە›. هەروەها: **دست‌چین بودن؛ دست‌چین شدن؛ دست‌چین کردن**

**دست‌خالی** / dast(e)xālî/: [فارسی/ عربی] *قید.* دەس‌بەتاڵ؛ دەس‌خاڵی؛ بە دەس/ دەستی خاڵیەوە: ۱. دەستی‌خاڵی؛ بێ دەسمایە و ئامێری پێویست ‹دست‌خالی کە نمی‌شود خانە ساخت: دەس‌بەتاڵ ماڵ دروست ناکرێ› ۲. بەبێ دەسکەوت ‹خواستگار را دست‌خالی برگرداندند: داواکاریان بە دەس‌خاڵی گەڕاندەوە›.

**دستخط** / dastxat(t) ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* دەستخەت؛ دەسخەت؛ دەسکڕ: ۱. دەس‌وخەت؛ دەستوخەت؛ ئەوەی بە دەستی کەسێ نووسراوە ۲. *[مجازی]* نامە ‹برو از رییس یک دستخط بیار تا پولت را بدهم: بڕۆ لای سەرۆکەوە دەستخەتێک بێنە تا پووڵەکەت پێ بدەم›.

**دستخورده** / dastxorde ، ـها/: *صفت. [مجازی]* دەس‌لێدراو؛ دەس‌خواردوو؛ جێبەجێ‌کراو یان گۆڕاو بە دەستی کەسێک.

**دستخوش**[1] / dastxoš/: *اسم.* دەسخۆشانە؛ دەسخوەشانە: ۱. پارەیێ کە وەکوو مزگێنی لە قوماربازی بەرەندەی وەردەگرن ۲. خەڵات ‹بابت خدمتی کە کردە بود دە هزار تومان دستخوش گرفت: بە بۆنەی ئەو خزمەتە کردبووی دە هەزار تمەن دەسخوشانەی وەرگرت›. هەروەها: **دستخوش داشتن؛ دستخوش گرفتن**

**دستخوش**[2]: *صفت. [مجازی]* تووشیار؛ لە ژێر کارتێکەری شتێکەوە ‹دستخوش سیل: دستخوش جنگ: تووشیاری لافاو؛ تووشیاری شەڕ›. هەروەها: **دستخوش (چیزی) بودن؛ دستخوش (چیزی) شدن؛ دستخوش (چیزی) کردن**

**دستخوش**[3]: *دعا. [گفتاری]* دەسخۆش؛ دەسوەش؛ مالاوا؛ ئافەرین (زۆرتر بە شێوەی تەشەر بە کار دەبرێ) ‹بابا دستخوش، عجب رفاقتی کردی!: دەسخۆش برا، بۆ دۆستیەک کردت!›.

**دست‌درازی** / dastderāzî ، ـها/: *اسم. [مجازی]* دەست‌درێژی؛ دەسدرێژی؛ تێکۆشانی ناڕەوا بۆ کەڵکوەرگرتن لە شتێ کە هی یەکێکی ترە ‹از دست‌درازی زورمندان بە اموال مردم جلوگیری شود: لە دەسدرێژی زۆرداران بۆ ماڵی خەڵکی بەرگری بکرێ›.

**دستدرد** / dastdard/ ☜ **ـ درد**[2]

**دستدوز** / dastdûz ، ـها/: *صفت.* دەسدروو؛ دەسچن؛ بە دەست دووراو ‹این کفش دستدوز است: ئەم پێڵاوە دەسدرووە›.

**دست‌دوم** / dast(e)dovvom ، ـها/: *صفت.* دەستەدوو؛ دەسەدوو؛ بەکار براوی وا کە

ئێستاش بە کار بێ. بەرانبەر: **دستاول** ‹لباس دستدوم: فرش دستدوم: جلی دەستەدووە؛ قالی دەستەدووە›.

**دسترس** / dastres/: اسم. ڕادەس؛ دەردەس؛ دەردەست؛ بەردەست؛ بەردەس؛ دەستڕەس؛ دەسڕەس؛ لادەس؛ وەردەسی؛ قامچ؛ کیس؛ قیس؛ جێگایەک کە بە سانایی دەستی پێ ڕابگا ‹دارو را از دسترس کودکان دور نگهدارید: دەرمان لە بەردەسی منداڵان دامەنێن›.

◘ در دسرس بودن: لە بەردەستدا بوون؛ لە بەردەسا بوون؛ لە دەستڕەسدا بوون؛ وەر دەسەنە بیەی؛ ڕا دەسەنە بیەی ‹هرچه در دسترس بود فرستاده شد: هەرچی لە بەردەستدا بوو ناردرا›. هەروەها: **در دسترس قرار دادن؛ در دسترس قرار گرفتن؛ در دسترس گذاشتن**

**دسترسی** / dastresî/: اسم. دەستڕەسی؛ دەسڕەسی؛ دەسەیاو؛ هەنا؛ توانایی یان لوان بۆ دەست گەیشتن بە کەسێ یان شتێک ‹آن روز به کسی دسترسی نداشتیم تا کمکمان کند: ئەو ڕۆژە بە هیچ کەسێک دەستڕەسیمان نەبوو یارمەتیمان بدا›.

**دسترنج** / dastranc، ـها/: اسم. [مجازی] دەسڕەنج؛ خەبس؛ ئەوەی کە بە هۆی کار و تێکۆشانەوە بە دەستدێ ‹او کارگری می‌کرد و از دسترنج خودش نان می‌خورد: کرێکاری دەکرد و لە دەسڕەنجی خۆی دەخوارد›.

**دست‌ساز** / dastsāz، ـها/: صفت. دەستساز؛ دەسساز؛ دەستکار؛ دەستکرد؛ دەسکرد؛ دەسکار؛ دەسکوت؛ دروستکراو بە دەست و بێ‌کەلک وەرگرتن لە ماشین ‹دیروز یک بمب دست‌ساز در کوچەی ما منفجر شد: دوێنێ بومبێکی دەستساز لە کۆڵانی مەدا تەقیەوە›.

**دستشده** / dastešde(h)/: اسم. داشباڵ؛ خیتخیتێن؛ خیتخیتێنە؛ گەمەیەکی بە کۆمەڵ کە یاریکەران شتێ (زیاتر تۆپ) بۆ یەکتری دەخەن و یەکێ لەوان (بە ناوی گورگ) دەبێ تۆپەکەیان لێ بستێنێ تا ئەو کەسەی تۆپەکەی لێ ڕفاوە لە جێی ئەو ببێتە گورگ.

**دستشویی** / dastšûyî، ـها/: اسم. ۱. ئابدەستخانە؛ ئابخانە؛ دەستشۆ؛ دەستشۆر؛ دەستشۆرک؛ دەسشۆیی؛ جێگەی دەست لێشوتن ۲. [کنایی] دەساو؛ دەس بەئاو؛ کناراو؛ مستەراو؛ مەستەراو؛ مەستەراح؛ سەرحەوز.

**دستفروش** / dastfurûš، ـها؛ ـان/: اسم. [مجازی] دێوەرە؛ چەرچی؛ دەسگێڕ؛ دەستفرۆش؛ دەسفرۆش؛ دەزگێڕ؛ بەخەڵفرۆش؛ وردەواڵە فرۆش؛ فرۆشەری گەڕیدەی بێدووکان کە شتەکانی لە سەر دەست یان چوارچەرخێک لە کووچە و کۆڵاناندا دەفرۆشێ.

**دستفروشی** / dastfurûšî/: اسم. [مجازی] دەستفرۆشی؛ دەسفرۆشی؛ دەزگێڕی؛ وردەواڵە فرۆشی؛ چەرچێیتی؛ کار یان پیشەی بەخەڵفرۆش.

**دستفنگ** / dastfang/: اسم. [نظامی] دەسفەنگ؛ چەشنێ ڕاگرتنی تفەنگ بە لاری لە سەر سنگ، کە لوولەکەی بە لای چەپدا و قۆناخەکەی بە لای ڕاستدایە.

**دستک** / dastak، ـها/: اسم. [مجازی] ۱. دەفتەر؛ تێنووس؛ پەڕاوێک کە حەسێبگەلی ڕۆژانەی تێدا دەنووسن ‹دفتر و دستک مرتبی داشت: دەفتەرێکی ڕێکوپێکی هەبوو› ۲. قیسپ؛ قسپ؛ تیرەک؛ دیرەک؛ تیرک ۳. داردەست؛ داردەس؛ تێلا ٤. ئەستوندەک؛ ئەستوونەک؛ ئامێرێک بۆ بەرگری لە هاتوچووی ماشێن بۆ پیادەڕۆ ٥. [نامتداول] چەپڵە؛ چەپ؛ دەست؛ دەس؛ کار یان ڕەوتی لە یەکتردانی لەپی دەست بە نیشانەی کەیف و شادی.

◘ دستک زدن: [نامتداول] دەست لێدان؛ دەس لێدان؛ چەپڵە لێدان؛ چەپ لێدان.

**دستکار**[1] / dastkār، ـان/: اسم. دەستکار؛ دەسکار؛ کەسێ کە بە دەست یان ئامێری

دەستی کار دەکا.

**دستکار**[۲]: *صفت.* دەس‌وکار؛ دەستکرد؛ دەستکار؛ دەسکار؛ دەسکەرد؛ دروووسکراو بە دەست (نە بە ماشین) ‹این تختە نرد دستکار سنندج است: ئەم تەختەیە دەس‌وکاری سنەیە›.

**دستکاری** / dastkārî، ـها/: *اسم.* دەسکاری؛ دەستکاری؛ دەسەژیە؛ کلگەوری؛ کار یان ڕەوتی دەست دان لە شتێ، گۆڕان و جێبەجێ کردن (و زۆرتر تێکدانی) ‹کسی وسایل مرا دستکاری کردە؟: کەسێ شتەکانمی دەستکاری کردووە؟›.

**دستکش** / dastkeš، ـها/: *اسم.* دەسکێش؛ دەسەوانە؛ دەستەوانە؛ لەپک؛ لاپک؛ لەپک؛ لەپێک؛ لەپیک؛ تەتک؛ دەستگۆرک؛ پۆشەنێکی نەرم (چنراوە، چەرم، لاستیک یان پلاستیک) بۆ دەست ‹در این هوای گرم دستکش چرمی پوشیده بود: لەم گەرمایەدا دەسکێشێکی چەرمی لە دەست کردبوو›.

**دست‌کم**[۱] / dast(e)kam/: *صفت.* کەم‌بایی؛ بێ‌بایی؛ کەم‌بایەخ؛ کەم‌نرخ؛ بە بایەخ و گرنگی کەمەوە.

**دست‌کم**[۲]: *قید.* لانی‌کەم؛ لای‌کەم؛ بە لانی کەمەوە؛ دەستی‌کەم؛ دەسکەم: ۱. لە کەمترین بەراورددا ‹دست‌کم صد تومان می‌ارزید: لانی‌کەم سەد تمەن ئەژیا› ۲. بە نیشانەی کەمترین کار ‹دست‌کم خوب نگاهش کن: لانی‌کەم جوان چاوی لێکە›.

▣ **دست کم گرفتن:** *[مجازی]* سووک لێ‌نەوین؛ دەسکەم گرتن؛ کەم بایەخ دان؛ بە کەم زانین؛ کەمتر یان خوارتر لە ڕادەی ڕاستەقینە دانان ‹او را این‌قدر دست‌کم نگیر، برای خودش مردی است: ئەوندە سووک لێی مەنەوە، بۆ خۆی پیاوێکە›.

**دست‌کمی** / dast(e)kamî/: *اسم. [گفتاری]* کەمی؛ کەمتری؛ دەست‌کەمی ‹این ماشین هم از آن یکی هیچ دست‌کمی ندارد: ئەم ماشینە هیچ کەمی لەوی دیکە نیە›.

**دستک‌ودنبک** /dastak-o-dombak, -donbak/: *اسم. [تعریض]* دەوڵ و زوڕنا؛ زرم و کوت؛ مووسیقا و هەڵپەڕکێ.

▣ **دستک‌ودنبک درآوردن:** بڕ و بیانوو هێنانەوە؛ بۆ تاشین؛ بیانک هاوردنەوە و تەگەرە خستنە بەر کارەوە.

**دستگاه** / dastgāh، ـها/: *اسم.* دەزگا؛ دەسگا: ۱. کۆئەندام؛ کۆندام؛ دەستەیەک لە شت و ماکگەل یان کەسانێ کە بە هاوگری و هاوکاری یەکەوە، بە شێوەی کۆیەک، کار یان کارگەلێکی دیاریکراو ئەنجام دەدەن ۲. دامودەزگا؛ دەمودەزگا؛ کەل‌وپەلی تێر و تەسەل و بەشکۆی ژیان ‹بیا ببین چە دستگاهی درست کردە است: بڕوانە چ دامودەزگایەکی پێکەوە ناوە› ۳. *[موسیقی]* هەر کام لە حەوت قالبی مووسیقای ئاوازی ئێران ۴. یەکەی ژماردنی کەل‌وپەلی دەسکرد ‹دو دستگاه رادیو؛ پنج دستگاه آپارتمان: دوو دەسگا ڕادیۆ؛ پێنج دەزگا وارخان› ۵. نیزام؛ سامانە ۶. *[نجوم]* کۆمەڵە؛ کۆما؛ کۆمەڵێک لە گەڕۆک و مانگ کە بە دەوری ئەستێرەیەکدا دەخولێنەوە.

▣ **دستگاه آوندی:** کۆندامی ئاوەندی: ۱. *[گیاه‌شناسی]* شانەگەلی پێکهاتوو لە ئاوەندی چێوی و ئاوکێش کە ڕاگوێزانی ماکی بژیەنی یان پتەوکردنی گیای لە ئەستۆدایە ۲. *[جانورشناسی]* کۆندامی گەڕانی خوێن یان ئاو.

**دستگاه تناسلی** ☜ اندام تناسلی، **اندام**

**دستگاه تنفس:** کۆندامی هەناسەدان؛ سەرجەمی ئەو ئەندامانە کە ئۆکسیژن و گازی کەربون لە نێوان لەش و دەرەوە دەگۆڕنەوە.

**دستگاه عصبی:** کۆندامی دەماری؛ دەسگای دەماری؛ کۆندامێک لە لەشی گیانەوەران کە بریتیە لە: مێشک، مۆخ؛ دەمارگەلی کاپۆلی و ئاقاری.

**دستگاه عصبی خودکار** ☜ **دستگاه عصبی**

**نباتی**
**دستگاه عصبی مرکزی:** کۆندامی دەماری ناوەندی؛ بەشێک لە کۆندامی دەماری کە بریتیە لە: مێشک لە کاپۆڵدا و مۆخ لە بربڕاگەدا.
**دستگاه عصبی نباتی:** کۆندامی دەماری ڕووەکی؛ بەشێک لە کۆندامی دەماری، سەر بە میزان‌کردنی کاری ماسولکەی ناویستی، هەناو و ڕەگگەلی خوێنی: **دستگاه عصبی خودکار**
**دستگاه گردش خون:** کۆندامی گەڕانی خوێن؛ کۆندامێک بریتی لە دڵ، ڕەگی خوێنبەر و خوێنهێن و مووڕەگ کە خوێن تێیاندا هاتوچۆ دەکا.
**دستگاه گوارش:** کۆندامی هەرسەک؛ کۆندامێک بریتی لە دەم، گەروو، گەدە، ڕیخۆڵە، جەرگ و زراو کە هەڵتاوینی خۆراکی لە ئەستۆدایە.
**دستگاه لنفاوی:** کۆندامی لەنفاوی؛ سەرجەمی ڕەگ و مووڕەگی لەنفی مۆرغەداران کە لە ڕێگەی ڕەگی خوێن‌هێنی دڵەوە، لەنف دەگەیەننە خوێن.
**دست‌گرمی** / dastgarmî/: *اسم. [گفتاری]* دەس‌ڕەوانی؛ دەست‌گەرمی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تەیار بوون بۆ کارێ بەتایبەت بۆ پێڕاهاتن ‹این را همین طور برای دستگرمی ساختم: ئەمەم هەروا بۆ دەس‌ڕەوانی دروست‌کرد›.
**دستگیر** / dastgîr/: *صفت.* ۱. باڵبەست؛ باڵبەستە؛ قۆڵبەستە؛ قۆڵبەست؛ گیراو؛ گیرۆدە ۲. *[مجازی]* پشتیوان؛ دەسگیر؛ یاریدەدەر؛ یاریدەر؛ دەسگیرۆ؛ پشتگر؛ یاوەر؛ یارمەتی‌دەر ‹مرد آن است کە دستگیر افتادگان باشد: پیاو ئەو پیاوەیە کە پشتیوانی لێقەوماوەیە›.
▣ **دستگیر (کسی) شدن:** *[گفتاری]* ۱. گیر (کەسێ) کەوتن؛ وە بەر (کەسێ) کەوتن ۲. *[مجازی]* دەسگیر (کەسێ) بوون؛ دەست (کەسێ) کەوتن؛ هاتنە دەس/ دەست؛ ئاگایی بە دەست هێنان ‹از او چیزی دستگیرت نمی‌شود: لەوەوە شتێکت دەستگیر نابێ›.
**دستگیره** / dastgîre، ـها/: *اسم.* دەسگیر؛ دەسگیرە؛ دەسەگیرە؛ دەستگیرە: ۱. دەسک؛ هەنگڵ؛ دەسکە؛ گیرنگە؛ ئامێرێ بۆ بە دەستەوە گرتن ‹دستگیره را گرفتم تا نیفتم: دەسگیرەکەم گرت نەکەوم› ۲. ئامێرێ لە سەر درگا و پەنجەرەوە بۆ کردنەوە و پێوەدانی ۳. دەسگرە؛ دەزگرە؛ ئامێری بۆ گرتن و جێبەجێ‌کردنی دەفری داخ کە زۆرتر لە پارچەیە.
**دستگیری** / dastgîrî، ـها/: *اسم.* ۱. کاری گرتن؛ باڵبەست کردن؛ زۆرتر بۆ ڕاگەییشتن بە تاوان ‹برای دستگیری متهم به خانه‌اش رفتند: بۆ گرتنی تاوانبار چوونە ماڵەکەی› ۲. پشتیوانی؛ پشتگری؛ دەستگیرۆیی؛ دەسگیری؛ کار یان ڕەوتی یارمەتی دان بە داخوازیگەل ‹دستگیری کردن از بینوایان: پشتیوانی‌کردن لە بێ‌ئەنوایان›.
**دستلاف** / dastlāf/ ☜ **دشت ـ۲**
**دستمال** / dastmāl، ـها/: *اسم.* دەسماڵ؛ دەسرە؛ دەسەر؛ دەسەسڕ؛ دەسۆک؛ دەسرەدەس؛ دەرسۆک؛ تەهرە؛ مەندیل؛ کەفی؛ کەفیک؛ کەهک؛ کەهیک؛ پەشتەماڵ؛ دەرچاڤ؛ دەرچاو؛ بەشە پارچەیەکی چوارگۆشە کە بۆ سڕین یان وشک کردنەوە بە کار دێ.
▣ **دستمالِ سفره** ☜ **دستمال‌سفره**
**دستمالِ کاغذی** ☜ **دستمال‌کاغذی**
**دستمالِ گردن** ☜ **دستمال‌گردن**
**دستمال‌سفره** / dastmāl(e)sofre، ـها/: *اسم.* بەروان؛ بەروانە؛ بەروانک؛ بەرانک؛ دەسماڵێک لە سەر سفرەوە بۆ سڕینی دەم و پل و بەرگری لە پیس بوونی جل و بەرگ.
**دستمال‌کاغذی** / dastmālkāqazî، ـها/: [فارسی/ از چینی] *اسم.* دەسرەی کاغەزی؛

دەسماڵ کاغەزی؛ چەشنێک کاغەزی لۆکەیی مژێنەر کە بە جێگای دەسماڵ بۆ جارێک کەڵکی لێوەردەگرن.

**دستمال‌گردن** / dastmālgardan ، ـها/: *اسم.* دەورملی؛ دەسرەملی؛ چەشنێک دەسرە کە بۆ جوانی لە ملی دەکەن.

**دستمالی** / dastmālî/: *اسم. [گفتاری]* دەساژۆ؛ دەساوەژۆ؛ کاری خراپ یان پیس‌کردنی شتێک بە هۆی دەست ساوین بە سەریدا یان گرتنی بە دەستەوە ‹نگذار بچەها میوەها را دستمالی کنند: مەهێڵە منداڵەکان میوەکە دەساژۆ کەن›.

**دست‌مایه** / dastmāye ، ـها/: *اسم.* دەسمایە؛ دەستمایە؛ سەرمایەی کەم.

**دست مریزاد** / dastmarîzād/: *دعا.* دەسخۆش؛ دەستخۆش؛ دەسوەش؛ هۆپ؛ وتەی پەسند کردن.

**دستمزد** / dastmozd ، ـها/: *اسم.* مز؛ کارانە؛ دەستمز؛ کرێی دەستی؛ پارە یان کالایەک کە لە بەرانبەر کارێکەوە بە کەسێک دەدرێ ‹در اینجا دستمزد خیلی پایین است: لێرەدا مز زۆر کەمە›.

**دستنبو** / dastambû, dastanbû ، ـها/: *اسم.* شەمامە؛ شمامە؛ شەمام؛ شمام؛ شەمامۆ؛ شمامۆک؛ شەمامۆک؛ شەمامۆکە؛ شەموومە؛ دەساموو؛ کەموو: ۱. گیایەکی بنچکی لە تیرەی خەیار بە بۆنێکی خۆشەوە ۲. بەری ئەو گیایە: **شَمامه**

**دست‌نخورده** / dastnaxorde/: *قید.* دەژ؛ بە دەژی؛ سەربەمۆر؛ سەرمۆر؛ سەردەق؛ دەسنەوارده؛ دەست لێنەدراو ‹همه چیز همان‌طور دست‌نخورده مانده بود: هەموو شتێک هەروا دەژ مابوو›.

**دست‌نشانده** / dastnešānde ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* *[مجازی]* داسپاردە؛ دەسنیشان؛ دەسنێژ؛ دانریاگ؛ خاوەن پیشە یان پلە و پایەیەک کە لە لایەن کەسی‌ترەوە داندراوە و گوێڕایەڵی ئەوە ‹دولت دست‌نشانده؛ رییس دست‌نشانده: دەوڵەتی داسپاردە؛ بەرپرسی داسپاردە›.

**دستنوشته** / dastnevešte ، ـها/: *اسم.* دەستنووس؛ دەس‌نووس؛ بەڵگەیێ (کتێب یان کاغەز) کە چاپی نیە و بە دەستی کەسێک بە قەڵەم نووسراوە: **دستنویس**

**دستنویس**[1] / dastnevîs ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* دەستنووس؛ دەس‌نووس؛ کتێب یان هەر شتێکی وەکوو کتێب کە بە دەست نووسراوە ‹دستنویس مقاله را با خودش آورده بود: دەستنووسی وتارەکەی لەگەڵ خۆ هێنابوو›: **دستنوشته**

**دستنویس**[2]: *صفت.* دەستنووس؛ دەس‌نووس؛ نووسراو بە دەست ‹مقاله دستنویس بود، دادیم تایپش کنند: وتارەکە دەستنووس بوو، دامان پیتچنی کەن›.

**دستوارگی** / dastvāregî/: *اسم. [پزشکی]* ئۆگرەتی بە کەڵک وەرگرتن لە دەستێک زۆرتر لە ئەو دەستەکەی‌تر (وەک ڕاستدەستی و چەپدەستی).

**دست‌وبال** / dast-o-bāl/: *اسم. [گفتاری]* ۱. دەست و پل؛ دەس و باڵ؛ دەسگەل ‹دست و بال بچه را خوب شست؟: دەست و پێی منداڵەکەی باش شۆرد؟› ۲. دەست و پێ؛ دەس و پا.

**دست‌وپا** / dast-o-pā/: *اسم.* ۱. دەست و پێ؛ دەس و پا؛ ئەندامگەلی دواینی مرۆ، چوارپێیان و بڕێک گیانداری‌تر ۲. *[مجازی]* دەستودوو؛ پەل‌وپۆ؛ زرەنگی؛ زرینگی؛ زیرەکی ۳. *[مجازی]* دەس‌وپل؛ پەل‌وپۆ؛ جموجووڵ؛ بزاڤ؛ لەپت.

▣ دست و پا زدن: ۱. قولەفڕێ کردن؛ لاقەفرتە کردن؛ لەقەفرتێ کردن؛ دەست و پا تەکان دان ‹دست و پا می‌زد و نمی‌گذاشت آمپولش را تزریق کنند: قولەفڕێی دەکرد و نەیدەهێشت دەرزیەکەی لێبدەن› ۲. *[کنایی]* پەلەقاژێ کردن؛ پەلەقاژە کردن؛ پەلەفرتێ کردن؛ پەلەفرتە کردن؛ پالەقە کردن؛ پاقژە کردن؛

پەلەکوتێ کردن؛ پلووشانن؛ دەست و لاق جووڵاندنەوە بۆ ڕزگار بوون لە چۆرتم ‹برای نجات خودش دست و پا می‌زد: بۆ ڕزگاری خۆی پەلەقاژەی دەکرد›.

**دست و پا کردن**: *[مجازی]* جۆرکردن؛ هاوردنە دەس؛ تەیارکردن ‹سرانجام توانست برای خودش کاری دست و پا کند: ئاخری توانی کارێک بۆ خۆی جور بکا›.

**دست و پای خود را جمع کردن**: *[کنایی]* ۱. خۆ لێ هەڵ کردن؛ قۆڵ لێ هەڵماڵین؛ خۆی بۆ تەیارکردن ۲. خۆ کۆکردنەوە؛ خۆ پێچانەوە؛ بە خۆدا هاتنەوە؛ فڕ بە خۆوە بوون؛ ئاگا لە خۆ بوون؛ ئاگاداری ئاکاری خۆ بوون و هەڵسەنگاندنی ‹با یک نگاه خشمگین مدیر، همه دست و پای خود را جمع کردند: بە مۆڕ بردنەوەیەکی بەرپرس، هەموو خۆیان کۆ کردەوە›.

**دست و پای خود را گم کردن**: *[مجازی]* شڵەژان؛ شپرز بوون؛ سەر لێ شێوان؛ دەست و پای خۆ گوم کردن ‹وقتی سرزده وارد شد دست و پای خود را گم کردم و زبانم بند آمد: هەر کە لە پڕ هاتە ژوورەوە شڵەژام و زمانم بەست›.

**به دست و پا افتادن**: *[کنایی]* کەوتنە خۆ؛ کەوتنە پەل‌وپۆ؛ پەلەپرووسکێ‌کردن؛ کەوتنە هەوڵ دان؛ کەوتنە پەلەقاژە؛ کەوتنە جم‌وجووڵ.

روی دست و پای کسی افتادن ☜ رو[2]

زیر دست و پا افتادن ☜ زیر[3]

**دست‌وپاچلفتی** / dast-o-pāčoloftî/: *صفت.* *[گفتاری]* نەگومە: ۱. بێ‌دەسەلات؛ لێ‌نەهاتوو؛ بەبێ توانای کەڵک وەرگرتن لە دەست و پای خۆ ۲. *[کنایی]* گەمژە؛ حۆل؛ دەبەنگ؛ حەپۆل ❋ چلفتی

**دست و پادار** / dast-o-pādār/: *صفت.* *[گفتاری]* بە دەسەلات؛ دەسالاتدار؛ وساق؛ بەکار؛ زیت و زیرەک؛ لێهاتوو؛ کرژوگۆڵ؛ خاوەن توانایی و لێهاتوویی ‹دخترش خیلی دست و پادار است و کارها را اداره می‌کند: کچەکەی زۆر بە دەسەلاتە و کارەکان بەڕێوە دەبا›.

**دست و پاشکسته**[1] / dast-o-pāšekaste/: *صفت.* *[مجازی]* تەق‌ولەق؛ لەق‌وتەق؛ دەس‌وپێ شکاو؛ کەل و ناتەواو ‹با انگلیسی دست‌وپاشکسته به او فهماندم...: بە ئینگلیزیەکی تەق و لەق حاڵیم کرد...›.

**دست‌وپاشکسته**[2]: *قید.* تەق‌ولەق؛ لەق‌وتەق؛ بە ناتەواویەوە؛ دەس‌وپێ شکاو ‹دست‌وپاشکسته چیزهایی به او گفتم: تەق و لەق شتگەلێکم پێ‌گوت›.

**دست‌وپاگیر** / dast-o-pāgîr/: *صفت.* *[کنایی]* بەردەستگیر؛ بەردەسگر؛ هۆی بەرگری لە جووڵە یا چالاکی، یا خۆ کەم‌کردنەوەی ‹این میزها خیلی دست‌وپاگیر هستند: ئەم مێزانە زۆر بەردەستگیرن›.

**دست‌ودل‌باز** / dast-o-delbāz/: *صفت.* *[مجازی، گفتاری]* دەست‌بەردا؛ دەست‌بڵاو؛ دەسەنەدار؛ دەسواز؛ دەس‌ودڵ‌باز؛ چاڤڤەکری؛ بەخشێنەر؛ دڵاوا؛ دەهندە؛ دەهەندە؛ وساخە؛ خاوەن بەخشندەیی و بەزەیی ‹آرام دست‌ودل‌باز است: ئارام دەست‌بەردایە›.

**دست‌ودل‌بازی** / dast-o-delbāzî، ـها/: *اسم.* *[مجازی]* دەست‌بەردایی؛ دەست‌بڵاوی؛ دەسەنەداری؛ دەسوازی؛ دەس‌ودڵ‌بازی؛ دڵاوایی؛ بەخشندەیی؛ دەهندەیی؛ دەهەندەیی؛ وساخی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەخشندە بوون.

**دست‌ودل‌پاک** / dast-o-delpāk/: *صفت.* *[گفتاری]* دروستکار؛ پاک؛ دەست و دڵ پاک؛ دەس و چاو پاک؛ بە باوڕ و ئاکارێکی باشەوە.

هەروەها: **دست‌ودل‌پاک بودن؛ دست و دل پاکی**

**دستور** / dastûr، ـها/: *اسم.* دەستوور: ۱. /ـات/ فەرمان؛ ڕێچکە و ڕێباز؛ یاسا و ڕێسا؛

فەرمانێک لە لایەن پایە یان کەسێکی سەرترەوە کە تێیدا لە سەر ئەنجامدانی کارێک جەخت کراوە ‹این دستور جناب وزیر است: ئەمە دەستووری جەنابی وەزیرە› ٢. ڕێزمان؛ لقێک لە زانستی زمانەوانی کە لەمەڕ کاربەری وشە، پێکهاتە و ڕیزبەندی ڕستەوە باس دەکا ‹دستور زبان کردی: ڕێزمانی کوردی› ٣. /ـات/ فەرمان؛ فرمان؛ پێش‌بینیگەلێک بۆ چۆنیەتی ئەنجامدانی کارێ ‹دستور جلسه: فەرمانی دانیشتن› ٤. /ـات/ شێواز؛ شێوە و ڕەوشتی ئەنجامدانی کارێک ‹دستور پختن قورمەسبزی: شێوازی لێنانی خۆرشتی سەوزی› ٥. /ـان/ سەرناوێ بۆ مەلایانی زەردەشتی.

**دستورالعمل / dastûrol'amal** ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم*. فەرمان‌نامە؛ ڕێکارنامە؛ ڕێکار؛ نووسراوەیەک لەمەڕ چۆنیەتی ئەنجامدانی کار یان کارگەلێکەوە ‹دستورالعمل انتخابات: فەرمان‌نامەی هەڵبژاردن›.

**دستوری / dastûrî**/: *صفت*. ١. ڕێزمانی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ڕێزمانەوە ٢. فەرمایشی؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی فەرمان لە پشت بوونەوە ‹انتخابات دستوری: هەڵبژاردنی فەرمایشی›.

**دسته / daste** ، ـها/: *اسم*. دەستە؛ دەسە: ١. دەسک؛ دەسگ؛ کلک؛ دەسکە؛ هەنگڵ؛ بەشێک لە ئامێرێ بۆ گرتنە دەست، هەڵگرتن، ڕاگرتن یان جوولاندنەوەی ‹دسته‌ی ظرف؛ دسته‌ی اتو: دەسەی دەفر؛ دەستەی ئوتوو› ٢. پۆل؛ گۆل؛ تاقم؛ گرۆیەک کە ئەندامانی لە یەک چەشنن ‹یک دسته پرنده؛ یک دسته آدم: پولێک باڵندە؛ دەستەیەک مرۆڤ› ٣. چەپکە؛ دەسکە؛ چەپە؛ چەپ؛ بڕ؛ بەشێک لە شتێ کە لە دەستدا جێی دەبێتەوە ‹یک دسته اسکناس: دەستەیەک ئەسکەناس› ٤. چەپک؛ چەپکە؛ چەپە؛ دەسکە؛ چەند دانە لە شتێ کە بە بەن یان سیرمەیەک پێکەوە بەستراوە ‹یک دسته گل محمّدی: چەپکێک گوڵ‌گولاو› ٥. /دستجات/ گرۆیەک لە کەسان کە پێکەوە کارێکی دیاریکراو ئەنجام دەدەن ‹دسته‌ی ارکستر: دەستەی ئۆرکێستر› ٦. /دستجات/ *[نظامی]* پەل؛ یەگانێک بریتی لە سێ جووخە (دەور و بەری ٢٥ کەس).

▣ **دسته به راه انداختن**: دەسەودایرە ڕێخستن؛ گرۆیەک پێکەوە بۆ شوێنێ بەڕێ کردن (بەتایبەت بە مەبەستی ڕامیاری یان مەزهەبی).

**دسته کردن**: دەسەکردن؛ دەستەکردن؛ بە گوێرەی چەشن یان جنس لە هەژمار یان ئەندازەی دیاریکراودا ڕێکوپێک کردن ‹کاغذها را دسته کن و بگذار روی میز: کاغەزەکان دەستە بکە و بینە سەر مێزەکەوە›.

**دسته‌بندی / dastebandî** ، ـها/: *اسم*. دەستەبەندی؛ دەسەبەنی: ١. کار یان ڕەوتی دەستەکردن؛ ڕێک‌کردن و لە لای یەک دانانی شتی وەک یەک ‹پولها را دسته‌بندی کرد و گذاشت توی صندوق: پارەکانی دەستە کرد و خستیە نێو سندووقەوە› ٢. کار یان ڕەوتی پێکەوە هاوقۆڵ بوون و بوونە دەستەیەک بۆ وەپێش‌خستنی کارێک ‹هر یک از رهبران، دسته‌بندی جداگانه‌ای کرده بودند و برنامه‌های خودشان را دنبال می‌کردند: هەر کام لە ڕێبەرەکان دەستەبەندییەکی جیاوازیان ساز کردبوو، بەرنامەکانی خۆیان بەڕێوە دەبرد›.

هەروەها: **دسته‌بندی شدن؛ دسته‌بندی کردن**

**دسته‌جمعی** [1] **/ dastecam'î**/: [فارسی/ عربی] *صفت*. تێکڕایی؛ گشتی؛ هەمووتی؛ گەلەکۆیی؛ گەلەکۆمی؛ گەلەمپەری؛ گردی ‹گردش دسته‌جمعی: سەیرانی تێکڕایی›: **دستجمعی**

**دسته‌جمعی** [2]: *قید*. تێکڕایی؛ بە گشتی؛ هەمووتی؛ پێکەوە و بە شێوازی یەک دەستەیی ‹دسته‌جمعی پا شدیم و رفتیم پیش رییس: تێکڕایی هەستاین و چووین بۆ لای سەرۆک›: **دستجمعی**

**دسته‌چک / dasteček** ، ـها/: [فارسی/ انگلیسی] *اسم*. دەستەچەک؛ دەسەچەک؛ پەڕاوێکی چاپی،

بریتی لە چەند بەرگە چەک کە لە لایەن بانکەوە بە مشتەریان دەدرێت.

**دەستەدار** / dastedār/: *صفت.* دەسکدار؛ دەسەدار؛ دەستەدار؛ بە دەسک؛ بە هەنگڵ؛ قوڵفدار: *الف)* کلکدار؛ کلکن؛ خاوەن شتگەلێک بۆ بە دەستەوەگرتن ‹لیوان دستەدار: لیوانی دەستەدار› *ب)* خاوەن جێگایەک بۆ دەست لە سەر دانان ‹صندلی دستەدار: سەندەلی دەسەکدار›.

**دستەگل** / dastegol ، ـها/: *اسم.* چەپکەگوڵ؛ چەپک؛ دەسەگوڵ؛ دەسکەگوڵ؛ قەفت؛ هوویزێ؛ چەن تەڵ گوڵ کە پێکەوە بەسراون ‹همە دستەگل آوردە بودند، جز ما: هەموو چەپکەگولیان هێنا بوو، جگە لە ئێمە›.

▣ **دستەگل بە آب دادن**: *[کنایی]* پەن دان؛ گوڵ بە بادان؛ تووشی هەڵە و پەڵەیەک بوون ‹باز دستەگل بە اب دادم، موجودی صندوق کسری دارد: دیسان پەنم داوە، پارەی سندووق کەمی هێناوە›.

**دستی**[1] / dastî/: *صفت.* دەستی؛ دەسی: ۱. بە دەست جێبەجێکراو و بێکەڵک وەرگرتن لە ماشین (یان بە بێ ماشینی خۆمەش) ‹کار دستی: کاری دەستی› ۲. بە توانای کارکردن بە دەست ‹ترمز دستی: تورمزی دەستی› ۳. دەستەڵگر؛ بەدەسبر؛ تایبەتمەندی شتێک کە بە تاقە کەسێک بگۆزرێتەوە ‹تلویزیون دستی: تەلەویزیۆنی دەستەڵگر›.

**دستی**[2]: *قید.* دەستی؛ دەسی: ۱. بە شێوەی نەخت و بەبێ دان و گرتنی نووسراوەیەک ‹صد تومان هم دستی گرفت: سەد تمەنیشی دەستی وەرگرت› ۲. بە دەستی خۆ؛ بە هۆی دەستەوە ‹نامە را ببر دستی بدە: نامەکە بەرە و دەستی بیدەیە›.

**دستیابی** / dastyābî/: *اسم.* دەسەیاو؛ کار یان ڕەوتی دەست خستن؛ بە دەست هێنان ‹برای دستیابی بە هر چیز گرانبها باید تلاش کرد: بۆ دەست خستنی هەر شتێکی گرانبایی دەبێ کۆشش بکرێت›.

**دستیار** / dastyār ، ـها؛ ـان/: *اسم. [مجازی]* بەردەست؛ وەردەس؛ دەستیار؛ کۆمەککار؛ یاریدەر؛ خەڵفە؛ کەسێ کە لە کارێکدا ئاریکاری کەسێکیترە و لە ژێر دەستیدا کار دەکا ‹دستیار خلبان: بەردەستی فرۆکەوان›.

**دست یازی** / dastyāzî/: *اسم. [ادبی]* دەسدرێژی؛ کار یان ڕەوتی دەست بردن بۆ شتێ بە مەبەستی بە دەست هێنان یان کەڵک لێوەرگرتنی ‹دستیازی بە اموال مردم: دەسدرێژی بۆ ماڵی خەڵکی›.

**دستینە** / dastîne ، ـها/: *اسم.* ۱. *[قدیمی]* واژۆ؛ ئیمزا ۲. دەستنامە؛ کتێبی ڕێنوێنی؛ نامیلکەی ڕێنوما.

**دستی ـ دستی** /dastîdastî/: *قید.* بەقەستی؛ دەستی ـ دەستی؛ دەسی ـ دەسی؛ بە دەستی خۆ ‹دستی ـ دستی خودش را بە کشتن داد: بەقەستی خۆی بە کوشت دا›.

**دسر** / deser ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* دێسێر؛ ئەوەی (بریتی لە میوە یان شیرینی) کە دوای چێشتی سەرەکی دەخورێت ‹دسر عبارت بود از بستنی و خربزە: دیسێر بریتی بوو لە بەستەنی و کاڵەک›.

**دسیسە** / dasîse ، ـها؛ دسایس/: [عربی]/*اسم.* ۱. پیلان؛ نەخشەیەکی نهێنی بۆ کارێکی نارەوا و دژی قانوون ‹این دسیسەی همسایەها بود کە آبرویش را ببرند: ئەمە پیلانی دراوسێکان بوو کە بێ ئابرووی کەن› ۲. پیلانڕێژی؛ کاری پیلانگێران ‹نیروهایی در جامعە علیە یکدیگر دسیسە می‌چیدند: هێزگەلێک لە کۆمەڵگادا دژی یەکتر پیلانیان دەگێڕا›. هەروەها: **دسیسە چیدن؛ دسیسە کردن**

**دسیسەبازی** / dasîsebāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* پیلانگێری؛ پیلانڕێژی؛ کار یا ڕەوتی خۆ لە پیلانگەلی جۆراوجۆر دان بۆ گەییشتن بە مەبەست. هەروەها: **دسیسەجویی؛ دسیسەکاری**

**دسیسەچینی** / dasîsečînî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم. [مجازی]* پیلانڕێژی؛ کارەڕەهاتی پیلانگێڕان؛ خەنە بۆ گرتنەوە.

**دسیکاتور** / desîkātor ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* دێسیکاتور؛ دەفرێکی پتر شیشەیی بە سەرپۆشێکی هەوابەندەوە بۆ وشک‌کردنەوەی ماکی کیمیایی.

**دسی‌گرم** / desîg(e)ram/: [فرانسوی] *اسم.* دیسی‌گرەم؛ دەیەکی گرەم؛ یەکەی ئەندازەگرتنی قورسی بەرانبەر ٠,١ گرەم.

**دسی‌لیتر** / desîlîtr/: [فرانسوی] *اسم.* دیسی‌لیتر؛ دەیەکی لیتر؛ یەکەی ئەندازەگرتنی بارستایی بەرانبەر ٠,١ لیتر.

**دسیمتر** / desîmetr/: [فرانسوی] *اسم.* دیسی میتر؛ دەیەکی میتر؛ یەکەی پێوانی درێژایی بەرانبەر ٠,١ میتر.

**دش ـــ** / doš/: *پیشوند.* دژـــ ؛ دوژـــ ؛ دوشـــ ؛ خراپ؛ زشت ‹دشوار؛ دشمن: دژوار؛ دوژمن›.

**دشارژ** / dešārj/: [فرانسوی] *صفت.* خالی؛ بەتاڵ؛ هالی؛ والا.

▣ **دشارژ شدن:** خالی بوونەوە؛ داتەمران (زۆرتر لە پیلدا)؛ بەتاڵ بوونەوە؛ هاڵی بوونەوە؛ والا بوونەوە.

**دشپل** / došpel/ ☜ **دُژپیه**

**دشت** / dašt ، ـها/: *اسم.* دەشت: ١. دەشتە؛ چۆڵ؛ لەیلان؛ سارا؛ کرک؛ بیاوان؛ یاز؛ پێن؛ سەپاڵ؛ زەوینێکی پان و بەرین و بێدار یان بە داری کەم و لێک‌بلاوەوە ‹دشت شهرزور: دەشتی شارەزوور› ٢. سفتاح؛ داشت؛ سفتە؛ وەشت؛ هەوەڵ فرۆشی ڕۆژانە ‹امروز هنوز دشت نکردەام: ئەورۆ تا ئێستا سفتاحم نەکردووە›: **دَستلاف**

▣ **دشت ساحلی:** بەستێن؛ دەشتێک لە کەناری ڕەخاوەوە، بریتی لە زەوینگەلێک کە تازە لە ژێر ئاوەوە دەرهاتوون.

**دشت سیلابی:** زیخەلان؛ ڕیخەلان؛ دەشتێک لە هەوێرکەی ڕووباردا، کە لە تمتمانەکەی پێکهاتووە و لە لافاودا دادەپۆشرێ.

**دشت ماهوری:** کاجینە؛ زوورکان؛ دەشتێ کە تەپۆلکە‌ـتەپۆلکەی بچووکی تێدایە.

▣ **دشت کردن:** سفتاح‌کردن؛ هەوەڵین پارەی فرۆشی ڕۆژانە وەرگرتن ‹پول را گرفت و گفت بسم‌الله، امروز هم از دست شما دشت کردیم: پارەکەی وەرگرت و وتی بەناوخوا، ئەوڕۆش لە دەستی ئێوە سفتاحمان کرد›.

**دشت کسی را کور کردن:** *[مجازی]* ڕزقی کەسێک برین؛ نانی کەسێک برین؛ بوونە هۆی کەسادی کاری کەسێک.

**دشتبان** / daštbān ، ـها؛ ـان/: *اسم.* دەشتەوان؛ شەنەپا؛ وشەکە؛ کەسێ کە ئاگاداری زەوینگەلی کشت‌وکاڵی لە گوندێک یان بەشێک لەو گوندەی لە ئەستۆدایە.

**دشتگون** / daštgûn ، ـها/: *اسم. [زمین‌شناسی]* گۆڕەپان؛ پاناییێ لە زەوی کە بە هۆی داچوونەوە وەک دەشتی لێ‌هاتووە.

**دشتی**[1] / daštî/: *اسم. [موسیقی]* دەشتی؛ لە ئاوازگەلی ئێرانی لە دەستگای شوور، کە بارێکی خەمین و ناسکی هەیە.

**دشتی**[2]: *صفت.* دەشتەکی؛ دەشتی؛ پێوەندیدار یان هاوگەر بە دەشتەوە ‹آهوی دشتی: ئاسکی دەشتەکی›.

**دشداشه** / dašdāše ، ـها/: [عربی] *اسم.* دژداشە؛ دەشداشە؛ کراسی درێژ و فشی عەرەبی.

**دشک** / došak/: [ترکی] ☜ **تُشَک**

**دشکچه** / došakče/: [ترکی/ فارسی] ☜ **تُشَکچه**

**دشمن**[1] / došman ، ـها؛ ـان/: *اسم.* دوژمن؛ دژمەن؛ دژمین؛ دژمن؛ دژ؛ دوشمن؛ دوشمە؛ دشمن؛ دەقەز؛ مدەی؛ گاقبەر؛ نەیار؛ نەتل؛ نەتەل؛ نەتەوی؛ خەنیم؛ مەخرک؛ تاسب؛ مخانە؛ نەدۆست؛ خوێنەخوار؛ خوێنەخوارە؛ خووینەر: ١. ئەوەی کە لەمەڕ کەسێکەوە بەدخوازە ‹از آن

روز با آزاد دشمن شد: لەو ڕۆژەوە لەگەڵ ئازاددا بوو بە دوژمن›. ۲. کەس، گرۆ یان وڵاتێک کە لەگەڵ دیتری لە شەڕ و تووشی دان ‹کشور دشمن؛ نیروهای دشمن: وڵاتی دوژمن؛ هێزگەلی بەتەل›.

▣ دشمن جان: مێمڵ؛ مڵۆزم؛ دوژمنی گیان؛ قەستی سەر؛ ئەوەی کە بە دووی کوشتنی کەسێکەوەیە.

دشمن خانگی: دوژمنی خۆیی؛ دژمنێک کە لە دانیشتوانی ماڵ، شار یان وڵاتە.

دسمن خونی: خینی؛ خیندار؛ دژمنی خوێنی؛ خوێنەخۆ؛ خوێنەخوار؛ خوێنەخوارە؛ خووینەر؛ ئەوەی کە بە تەمای ڕشتنی خوێنی کەسێکە.

▣ دشمن تراشیدن: *[مجازی]* دشمن‌تراشی کردن ☜ **دشمن‌تراشی**

**دشمن**[2]: *صفت.* دوژمن؛ دژمن؛ دژمەن؛ دوشمن؛ دشمن؛ نەیار؛ گاڤبەر؛ نەتەل؛ نەتل؛ ناکۆک و نەساز ‹تنبلی، دشمن سلامت است: تەوەزەلی دوژمنی لەش‌ساغیە›. هەروەها: **دشمن بودن؛ دشمن شدن؛ دشمن کردن**

**دشمنانه** / došmanāne/: *صفت.* دوژمنانە؛ گاڤبەرانە؛ نەیارانە؛ وەکوو دوژمن ‹رفتار دشمنانه: ئاکاری دوژمنانە›.

**دشمن‌پرور** / došmanparvar ، ـان/: *صفت.* دژپەروەر؛ نەیاریار؛ یاریدەری دوژمنی خۆ.

**دشمن‌تراشی** / došmantarāšî ، ـها/: *اسم.* *[مجازی]* دوژمن‌تاشی؛ کار یان ئاکارێک کە هۆی هەڵخراندنی دژەبەرایەتی دیتران و بوونە دوژمنیانە؛ دژمن بۆ خۆ دروست کردن ‹با این مقاله‌ها که می‌نویسی، تنها برای خودت دشمن‌تراشی می‌کنی: بەم وتارانە دەیانووسی، هەر بۆ خۆت دوژمن دەتاشی›.

**دشمن‌خو** / došmanxû ، ـیان/: *صفت.* *[ادبی]* جەنگەرانی؛ جینگن؛ پلەندەر؛ دوژمن‌خۆ؛ شەڕاشۆ؛ بە ئاکاری دژمنانە و هۆگری نەیارانەوە.

**دشمن‌شاد** / došmanšād/: *صفت.* هۆی دڵخۆش کردنی دوژمن.

**دشمن‌شکن** / došmanšekan ، ـان/: *صفت.* دوژمن‌شکێن؛ دژمن‌بەزێن؛ بەزێنەری دژمن ‹نیروهای دشمن‌شکن: هێزگەلی دوژمن‌شکێن›.

**دشمنکام** / došmankām ، ـان/: *صفت.* *[ادبی]* ڕۆژڕەش؛ ڕۆژەڕەش؛ سیاچارە. هەروەها: **دشمنکام بودن؛ دشمنکام شدن؛ دشمنکام گشتن**

**دشمنی** / došmanî ، ـها/: *اسم.* دوژمنی؛ دژمنایەتی؛ نەیاری؛ دژایەتی؛ دژمناتی؛ دژمەنی؛ دژمەنی؛ دوشمنایەتی؛ دشمنی؛ لاری؛ نۆیین؛ بیڤک؛ ناحەزی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی دوشمن بوون ‹پس از آن، دوستی او تبدیل به دشمنی شد: دوای ئەوە، دۆستایەتیەکەی بوو بە دژمنایەتی› ۲. دژبەرایەتی و بەدخوازی ‹خیلی با ما دشمنی کرد: لەگەڵماندا زۆری دوژمنی کرد›. هەروەها: **دشمنی کردن؛ دشمنی ورزیدن**

**دشمنیار** / došmanyār ، ـان/: *صفت.* *[ادبی]* دۆس‌دوژمن؛ یاریدەری دوشمن؛ نەیاردۆس؛ پشتیوانی دژمەن.

**دشنام** / došnām ، ـها/: *اسم.* *[ادبی]* جوێن؛ جنێو؛ جوین؛ جمێن؛ دژمان؛ دژمانی؛ دشمان؛ دژنام؛ دژون؛ دژوون؛ دوژوین؛ دژووین؛ دژوێن؛ دمژین؛ دژمین؛ ژنێو؛ جوون؛ ژوون؛ ڤێس؛ چێڕ؛ سکان؛ سخیف؛ سخێف؛ سقێف؛ خەراو؛ خراو؛ خوسن؛ خۆسن؛ خەبەر؛ فاش؛ ناو یان ناونیتکەیەک بۆ بە خراو دەرکردنی کەسێک.

▣ **دشنام دادن/ گفتن:** جوێن‌دان؛ جنێودان؛ خەراو وتن؛ سخێف‌گوتن؛ ڤیلین؛ سکانن؛ دژمان دەی/ دای؛ ڤێسین؛ هەڵسکاندن؛ ششتن؛ شتن؛ شوست‌وشۆ دەرێنان.

**دشنام شنیدن:** جوێن بیستن؛ ناسزا بیستن؛ دژوێن ژنەفتن؛ دژمان ئژنیەی؛ دژمان واردەی ‹به خاطر تو از دیگران دشنام شنیدم: بە بۆنەی تۆوە لە خەڵکی جنێوم بیست›.

**دشنام‌آلود** / došnāmālûd/: *صفت.* جوێناوی؛

تێکەڵ بە جنێو.

**دشنام‌آمیز** / došnāmāmîz/: *صفت.* دژوێناوی؛ جنێواوی؛ تێکەڵاوی جوێن.

**دشنام گونه** / došnāmgûne/: *صفت.* دژوێن ئاسا؛ وەکوو جنێو.

**دشنامگویی** / došnāmgûyî ، ـهـا/: *اسم.* جنێوفرۆشی؛ دژمان‌دەری؛ جوێن‌فرۆشی؛ کار یان ڕەوتی جنێو دان.

**دشنه** / dešne, dašna ، ـها/: *اسم.* دشنه؛ کالانی؛ تووژگ؛ تیژک؛ چەقۆیەک بە تیغەی درێژ و تیژەوە بۆ چەقاندن بە جێیەکدا یان هەڵدڕینی شتێک (بەتایبەت لەش).

**دشوار** / došvār/: *صفت.* دژوار؛ دوژوار؛ ئەستەم؛ حاستەم؛ حەستەم؛ سەخت؛ دوخشار؛ چەتوون؛ ئارشە؛ ئاریشە؛ ئاسێ؛ هەسەم؛ هاسێ؛ عاسێ؛ هش؛ گران؛ نەگواز؛ بە دۆخ یان چۆنیەتیەکی وا کە هەڵکردن لەگەڵیدا زۆر سەختە. بەرانبەر: **آسان** ‹کار دشوار؛ زندگی دشوار: کاری دژوار؛ ژیانی حەستەم›.

**دشواری** / došvārî ، ـهـا/: *اسم.* دژواری؛ دوژواری؛ سەختی؛ چەتوونی؛ دۆخ یان چۆنیەتی حاستەم بوون. بەرانبەر: **آسانی**

**دعا** / do'ā ، ـها؛ ادعیّه/: [عربی]/*اسم.* نقا؛ دۆعا؛ دوعا: ۱. نزا؛ گاز؛ وتەگەلێک کە بۆ خواستنی شتێک، ڕوو بە خودا و بڕێ جار پێغەمبەر و پیرۆزان دەگوترێ ۲. *[اسلام]* نزا؛ گاز؛ کۆمەڵی داخوازی لە خودا، زۆرتر بە زمانی عەرەبی کە لە قورئان یان گەورەگەلی دینەوە وەرگیراون ۳. نووشتە؛ نۆشتە؛ نشتوو؛ نووسراوەیەک، جار و بارە لەگەڵ نیشانەگەلێک بۆ دەرمانی نەخۆشی یان بەرگری لە نەخۆشی.

▣ **دعای افطار**: دوعایەک کە لە کاتی بەربانگ کردنەوەدا دەخوێنرێت. هەروەها: **دعای تحویل سال**

**دعای بد**: تووک؛ نفر؛ نفرە؛ نفرین؛ دۆعای خراپ؛ دۆعای شەڕ.

**دعای خیر**: دۆعای چاکە؛ دۆعای خێر؛ داخوازی شتی باش لە خودا بۆ کەسێک.

▣ **دعا خواندن**: دۆعا خوێندن؛ گوتنی دۆعا؛ خوێندنەوەی نووسراوەیەکی دۆعایی کە بۆ ڕێوڕەسم یان ئایینێکی تایبەت ئامادەکراوە.

**دعا کردن**: دۆعا کردن؛ گازەکردن؛ نزا کردن؛ لە خودا پاڕینەوە؛ لە خودا یان هەر کەسێکی گەورە و مەزن شتێک خواستن.

**دعای کسی مستجاب/ اجابت شدن**: دۆعای کەسێک گرتن؛ دۆعای کەسێک گیرا بوون؛ دۆعای کەسێ کەوتنە کەرەم.

**دعا گرفتن**: نووشتەگرتن؛ لە نووشتەنووس بۆ بەدیهاتنی ئاوات داوای نووشتەکردن.

**دعا گفتن**: دۆعا کردن؛ بۆ کەسێک لە خودا شتێک خواستن.

**دعا نوشتن**: دۆعا نووسین؛ نووشتەکردن؛ نووشتە نووسین؛ بۆ بەرگری لە گەزن یان نەخۆشی نۆشتەکردن.

**دعات** / do'āt/: [عربی] جمعِ ☜ **داعی**

**دعاگو** / do'āgû ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* دۆعاخوێن؛ نزاخوان؛ نزاخوێن؛ کەسێ کە لە خودا بۆ کەسێکی تر داوای چاکە دەکا. هەروەها: **دعاگویی**

**دعانویس** / do'ānevîs ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /*اسم.* دۆعانووس؛ نووشتەنووس؛ نۆشتەنووس؛ کەسێ کە بۆ خەڵکی چاوەزار دەنووسێت. هەروەها: **دعانویسی**

**دعاوی** / da'āvî/: [عربی]/*اسم.* ۱. جمعِ ☜ **دعوا** ۲. جمعِ ☜ **دعوی**

**دعوا** / da'vā ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ۱. *[گفتاری]* داوا؛ شەڕ؛ جەنگ؛ جەنگەمرینگێ؛ ئاکارێک کە نیشانەی کاردانەوەیەکی ڕقاوی کەس یان گرۆیەک لە بەرانبەر کەس یان گرۆیەکی ترەوەیە: *الف)* شەڕەقسە؛ دەمەقاڵە؛

بۆرەبنار؛ بنار؛ گیروکێشە؛ گێرەوکێشە؛ کاری بە گژا چوون؛ هەڵپڕژانەوە ب) کار یان ڕەوتی لێکدان؛ گژیەی ۲. /دعاوی/ سکالا؛ سکاڵە؛ داخوازی یان شکاتێک کە لە دادگادا پێی ڕادەگەن.

▣ وسط دعوا نرخ طی/ تعیین کردن ☜ وسط

**دعوا داشتن:** ۱. شەڕهاتن؛ شەڕ خواردن؛ شەڕ بە دەستەوە بوون؛ جەنگ ئامەی/ ئامای ‹مگر دعوا داری؟: مەگەر شەڕت دی؟› ۲. شەڕ بوون؛ جەنگ بیەی؛ دوشمنایەتی و گێرەوکێشە بوون ‹دو سال با هم دعوا داشتند: دوو ساڵ پێکەوە شەڕیان بوو›.

**دعوا شدن:** بوونە شەڕ؛ شەڕ دروست بوون؛ شەڕ پێکهاتن؛ شەڕ خۆش بوون؛ شەڕ داگرسان؛ خۆش بوونی پێکدادان یان کێشە و هەرا ‹دیشب میان همسایەها دعوا شد: دوێشەو لە نێوان دراوسێکاندا بوو بە شەڕ›.

**دعوا کردن:** شەڕکردن؛ دەگژ ڕاچوون؛ هەڵپڕژانە سەر یەک؛ جەنگ کەردەی؛ گژیەی؛ گێرەوکێشەکردن و پێکدادان ‹همسایەها دعوا می‌کنند: دراوسێکان شەڕ دەکەن›.

**دعوائی** / da'vā'î/: [عربی] ☜ **دعوایی**

**دعوایی** / da'vāyî ، ـها/: [عربی] *صفت. [گفتاری]* شەڕانی؛ شەڕاشۆ؛ جەنگەرانی؛ تیزۆ؛ شاخی؛ درژ و گرژ؛ شەڕلا؛ ڕووش؛ هەڵتووزێن؛ هەڵچوو؛ جینگن؛ جرجۆنگانیێ؛ پلەندەر؛ پەنگڵەمێش؛ خاوەن ئاکاری ناهێمن و نەگونجاو ‹تازگیها خیلی دعوایی شده است: بە تازەیی زۆر شەڕانی لێدەرهاتووە›: **دعوائی**

**دعوت** / da'vat ، ـها/: [عربی] */سم.* بانگهێشتن؛ بانگێشتن؛ بانگەواز؛ لێ گێڕانەوە؛ دەعوەت؛ کار یان ڕەوتی بانگ‌کردنی کەسێک بۆ هاتنە جێگایەک یان ئەنجامدانی کارێک.

▣ **دعوت رسمی:** بانگێشتنی ڕەسمیێ؛ بانگهێشتنیێ کە لە لایەن خاوەن پلەوپایەیێک یان بە شێوەیەکی ڕەسمی بەڕێوە دەچێت.

▣ **دعوت حق را لبیک گفتن:** *[مجازی]* ئەمری خودا بەجێ هێنان؛ عەمر خوا کردن؛ مردن.

**دعوت داشتن:** بانگێشتن‌کران؛ دەعوەت بوون بۆ جێگایەک، بەتایبەت وەکوو میوانێک ‹من هم بە عروسی دعوت داشتم ولی نرفتم: منیش بۆ زەماوەند بانگێشتن کرابووم بەلام نەچووم›.

هەروەها: **دعوت شدن؛ دعوت کردن**

**دعوت کسی را اجابت کردن:** بانگێشتنی کەسێک قەبووڵ کردن؛ داوەتی کەسێک پەزێران؛ خوایشتی کەسێک پەزێران ‹دعوت او را اجابت کرد و در جلسە حاضر شد: بانگێشتنەکەی قەبووڵ کرد و لە دانیشتنەکەدا بەشدار بوو›.

**دعوتنامە** / da'vatnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی] */سم.* داوەتنامە؛ بانگێشتنامە؛ نامەیێ کە کەسێکی تێدا بۆ شوێن یان کارێک بانگ دەکەن ‹از کنگرە برایش دعوتنامە فرستادەاند: لە کونگرەوە بانگێشتنامەیان بۆ ناردووە›.

**دعوی** / da'vî ، ـها؛ دعاوی/: [عربی] */سم.* خوازە؛ داوا؛ وتەیەک کە دروستی یان نادروستیەکەی نەسەلماوە. هەروەها: **دعوی داشتن؛ دعوی کردن**

**دغدغان** / daqdaqān/ ☜ **داغداغان**

**دغدغک** / daqdaqak/ ☜ **قُدقُدک**

**دغدغە** / daqdaqe ، ـها/: [عربی] */سم.* نیگەرانی؛ کەڵکەڵە؛ ئەنێش؛ ترس؛ تەرسی؛ خۆف؛ بیم؛ هەراس؛ هەراسە.

▣ **دغدغەی خاطر:** پەرێشانی؛ بیرئاڵۆزی.

**دغسر** / daqsar/: */سم.* کەسێ کە بەر سەری تاسە.

**دغل** / daqal ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* گزیکار؛ گەڕباز؛ فاکوفیک‌کەر؛ چۆغڵ؛ دەغەڵ؛ فێلباز؛ ناڕاست؛ فریوکار؛ نادرووس؛ داوباز؛ گغنی‌باز؛ تەشقەڵە؛ کەڵەکباز: **دغلباز؛ دغلکار**

**دغلباز** / daqalbāz/: [عربی/ فارسی] ☜ **دغل**

**دغلبازی** / daqalbāzî/: [عربی/ فارسی] ☜ **دغلی**

**دغلکار** / daqalkār/: [عربی/ فارسی] ☜ **دغل**

**دغلکاری** / daqalkārî/: [عربی/ فارسی] ☜ **دغلی**

**دغلی** / daqalî ، ـها/: [عربی]/اسم. چۆغڵی؛ ناڕاستی؛ فێڵبازی؛ گزیکاری؛ فریوکاری؛ دەغەڵی؛ داوبازی؛ کەڵەکبازی؛ گغنیبازی؛ شڵتاخی؛ تەشقەڵەبازی: **دغلبازی؛ دغلکاری**

**دغمسه** / daqmase ، ـها/: [از عربی]/اسم. *[گفتاری]* قەرقەش؛ قەرقەشە؛ دەردیسەر؛ گیرە و قەرقەش؛ تەنگوچەڵەمە؛ بار و دۆخی دژوار و سەخڵەت: **دخمسه؛ دغمصه**

◙ **توی دغمسه افتادن**: کەوتنە چەڵەمەوە؛ تووش بوون؛ تووشی دەردیسەر هاتن؛ تووشی گیرە و قەرقەش بوون.

**دغمصه** / daqmase/: [عربی] ☜ **دغمسه**

**دف** / daf ، ـها/: [معرب از آرامی]/اسم. *[ادبی]* دەف؛ دەفە؛ دەفک؛ عارەبانە؛ ئامرازێکی مووزیک لە پێستی بە سەر کەمەدا کێشراو.

**دفاتر** / dafāter/: [عربی] جمعِ ☜ **دفتر**

**دفاع** / defā' ، ـها/: [عربی]/اسم. خۆپارێزی؛ بەرگری؛ بەرەڤانی: ١. بەرهەڵستی؛ بەرەنگاری؛ وەستانەوە لە بەرانبەر مەترسی یان هێرشەوە ‹در برابر مهاجمان از خودش دفاع کرد: لە بەرانبەر هێرشبەرانەوە خۆی پاراست› ٢. کار یان ڕەوتی بەڵگە هێنانەوە: *الف)* بۆ جواب دانەوە یا خۆ پەراندنەوە لە مەترسی ‹در برابر دادگاه از خودش دفاع کرد: لە بەرانبەر دادگاوە بەرەڤانی لە خۆی کرد› *ب)* بۆ نیشاندانی ڕاستی و دروستی شتێک کە قسەی لێکراوە ٣. باشار؛ بەرگیری؛ هەر کارێک بۆ بەرگریکردن لە سەرکەوتنی دوژمن یان هامبازەوە ٤. کەس، هێز یان ئامرازگەلێک کە کاری بەرگرییان وەئەستۆیە ٥. *[ورزش]* بەک؛ دیفاع؛ هەرکام لەو یاریکەرانەی تیمی فووتبال کە نزیکترن بە دەروازەوانەوە و لە پشت سەری یاریکەرەکانیتردان.

**دفاعی** / defā'î/: [عربی] صفت. بەرگرانە؛ پێشگرانە ‹نیروی دفاعی: هێزی بەرگرانە›.

**دفاعیات** / defā'îyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **دفاعیه**

**دفاعیه** / defā'îye ، ـها؛ دفاعیّات/: [عربی]/اسم. باشارنامە؛ بەرگرینامە؛ نووسراوە یان وتارێ کە بۆ بەرگری لە خوازە و داوای کەسێک بە کار دەڕوا ‹دفاعیەاش در روزنامەها چاپ شده است: باشارنامەکەی لە ڕۆژنامەکاندا چاپ بووە›.

**دفاین** / dafāyen/: [عربی] جمعِ ☜ **دفینه**

**دفتر** / daftar ، ـها؛ دفاتر/: [معرب از یونانی]/اسم. دەفتەر: ١. پەڕاو؛ تێنووس؛ پەڕاوی؛ دەستەیەک کاغەزی سپی پێکەوە لکاو/ دووراو کە بۆ نووسین بە کار دێ ‹دفتر مشق؛ دفتر اندیکاتور: پەراوی مەشق؛ دەفتەری ئەندیکاتۆر› ٢. نووسینگە؛ نڤیسنگە؛ مەکتەب؛ جێگایەک (بریتی لە یەک یان چەند هۆدە) کە دەوێدا کاری بازرگانی و مەزرینگەیی دەکرێت ‹دفتر وکالت: نووسینگەی بریکاری› ٣. نووسیگە؛ نووسگە؛ نووسینگە؛ نڤیسخانە؛ یازخانە؛ دەفتەرخانە؛ دیوی نووسینی بە کۆمەڵ؛ بەشێ لە دامەزراوە یان مەزرینگە کە کار و باری نامە نووسین و هەناردن و وەرگرتنی نامە جێبەجێ دەکا.

◙ **دفتر ارسال مراسلات** ☜ **دفتر نامەرسانی**

**دفتر اسناد رسمی**: دەفتەرخانە؛ نووسگە؛ نووسینگە؛ ڕێخراوەیەکی ڕەسمی بۆ تۆمار کردنی سەودا و دەرکردنی بەڵگە و نڤیسکی ڕەسمی: **دفترخانه؛ محضر**

**دفتر اموال**: دەفتەرێ کە ناو و نرخی هەموو دارایی دامەزراوەییێکی تێدا نووسراوە. هەروەها: **دفتر اسناد؛ دفتر کالا**

**دفتر اندیکاتور**: دەفتەری ئەندیکاتۆر؛ دەفتەری تۆمارکردنی مێژوو، ژمارە و کورتەی مەبەستی نامەگەلێ کە هاتووە یان نێردراوە: **دفتر نماینده**

**دفتر اندیکس**: پەڕاوی ئەندیکس؛ دەفتەرێ کە

نامەگەل بە ڕزنێکی تایبەتەوە تێیدا ژمارە دەبن و پاشان لە دەفتەری ئەندیکاتۆردا تۆمار دەکرێن: **دفتر راهنما**

**دفتر بايگاني:** پەڕاوی بایگانی؛ دەفتەرێ کە بەڵگەی بایگانی کراوی تێدا تۆمار دەبێ.

**دفتر پاكنويس:** پەڕاوی پاکنووس؛ دەفتەرێ کە نووسراوەگەلی تێدا پاکنووس دەکرێ.

هەروەها: **دفتر چركنويس**

**دفتر تجارتي:** ١. تێنووسی بازرگانی؛ دەفتەرێ کە هەر دامەزراوەیەکی بازرگانی لەسەریەتی کە حیسابگەلی یانەی بازرگانی تێدا بنووسێ و ئاگاداری لێوە بکا ٢. نووسینگەی بازرگانی؛ یانەی بازرگانی.

**دفتر خاطرات:** یادنامە؛ دەفتەری بیرەوەری.

**دفتر دارايي:** پەڕاوی دارایی؛ هەر یەکە لە دەفتەرگەلی قانوونی (وەک دەفتەری ڕۆژنامە و دەفتەری گشتی) کە هەر دامەزراوەیەکی بازرگانی دەبێ بیپارێزێ و هەمووساڵێک (بۆ دەستنیشان‌کردنی بڕی مالیات یان پێڕاگەیشتنی) نیشانی بەڕێوەبەرانی مەزرینگەی دارایی بدات.

**دفتر راهنما** ☜ **دفتر انديكس**

**دفتر روزنامه:** ١. پەڕاوی ڕۆژانە؛ تێنووسی ڕۆژانە؛ پەڕاوێ کە سەودا و مامەڵەی ڕۆژانەی دامەزراوەیەکی بازرگانی تێدا دەنووسن ٢. مەزرینگەی ڕۆژنامە.

**دفتر رونوشت:** پەڕاوی ڕوونووس؛ دەفتەرێ کە ڕوونڤیس لە هەموو نووسراوەگەلی دامەزراوەیەکی تێدایە: **دفتر كپيه**

**دفتر سياسي:** بنکەی ڕامیاری؛ دیوان؛ دەفتەری سیاسی؛ کومیتەی بەڕێوەبەرایەتی.

**دفتر سيمي:** پەڕاوی سیمی؛ پەڕاوی تەلبەست؛ دەفتەرێ کە پەڕەکانی بە تەل پێکەوە بەسراون.

**دفتر شطرنجي:** پەڕاوی شەترەنجی؛ دەفتەرێ کە کاغەزەکەی خان‌ـخانە.

**دفتر صورتجلسه:** پەڕاوی دانیشتن؛ دەفتەرێ کە باس‌وخواسی دانیشتنگەلی فەرمی دامەزراوە یان کۆڕێکی تێدا تۆمار دەکرێ.

**دفتر قانوني:** پەڕاوی قانوونی؛ هەر یەکە لە دەفتەرگەلی ماڵی دامەزراوەیەک کە لە لایەن مەزرینگەی داراییەوە پنج و مۆرکراوە و لە لێکدانەوەی حیسابەکاندا دەگەڕێنەوە سەری.

**دفتر كار:** نووسینگە؛ هۆدە یان خانوبەرەیێ کە دەوێدا چەشنێک چالاکی بازرگانی و مەزرینگەیی دەکرێت.

**دفتر كپيه** ☜ **دفتر رونوشت**

**دفتر كلّ:** پەڕاوی گشت؛ گنووس؛ دەفتەرێ کە هەر دامەزراوەیەکی بازرگانی پێویستە ئاگاداری لێوە بکات و هەموو حەفتەیەک لانی کەم یەک جار گشت دانوستەکانی خۆی بابەت بە بابەت تێدا تۆمار بکا.

**دفتر مشق:** دەفتەری مەشق؛ پەڕاوێک کە قوتابی بۆ ڕاهاتن، دەرسەکانی تێدا دەنووسێت.

**دفتر مُعين:** لە دەفتەرگەلی بازرگانی کە تێیدا حیسابەکان بە هەڵاواردەیی لە پەڕەگەلی جیاوازدا دەنووسرێ.

**دفتر نامەرساني:** دەفتەرێک کە وەرگری نامە ئیمزای دەکا کە ڕاگەیەنێ کە نامەکەی وەرگرتووە: **دفتر ارسال مراسلات**

**دفتر نماينده** ☜ **دفتر انديكاتور**

**دفتر وكالت:** نووسینگەی بریکاری؛ شوێنی کارکردنی بریکار.

**دفتر يادبود:** دەفتەری بیرئانین؛ پەڕاوێ کە دیدارکەران بیروڕا یان بیرەوەری خۆیانی تێدا دەنووسن.

**دفتر يادداشت:** دەفتەری یادداشت؛ دەفتەرێ کە بۆ یادداشت‌کردنی نووسراوە بە کار دەبرێ.

**دفترچه** / daftarče ، ـها/: [معرب/ فارسی]/*اسم.* دەفتەرچە؛ دەفتەری چکۆلە.
◙ **دفترچەی پس‌انداز:** دەفتەرچەی پاشەکەوت.
**دفترخانه** / daftarxāne ، ـها/: [معرب/ فارسی] /*اسم.* دفتر اسناد رسمی ☜ **دفتر**
**دفتردار** / daftardār ، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] /*اسم.* دەفتەردار: ۱. کەسێ کە بەرپرسی نووسین، ڕێکوپێک کردن و ئاگاداری لە دەفتەرگەلی دامەزراوەیەکە ۲. سەردەفتەر؛ بەڕێوەبەر یان خاوەنی نووسینگە.
**دفترداری** / daftardārî/: [معرب/ فارسی]/*اسم.* دەفتەرداری: ۱. کار یان ڕەوتی ڕێکوپێک کردن و ئاگاداری لە دەفتەرگەلی دامەزراوەیەک ۲. پیشەی دەفتەردار.
**دفترک** / daftarak ، ـها/: [معرب/ فارسی]/*اسم.* بروشوور: ۱. نووسراوەی چاپی زیاتر لە دوولاپەڕە و کەمتر لە ٤٨ لاپەڕە، بێ‌بەرگ و شیرازەی تایبەت ۲. کورتە نووسراوەی چاپی سەبارەت بە تایبەتمەندی و چۆناوچۆنی کەرەستەیێک.
**دفتر و دستک** / daftar-o-dastak/: [معرب/ فارسی]/*اسم. [گفتاری]* دەفتەر و دەستەک؛ کۆمای دەفتەر، یادداشت و حسێبگەلی کەس یان مەزرینگەیەک.
**دفتری** / daftarî/: [معرب] *صفت.* نووسینگەیی؛ نووسگەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە نڤیسنگەوە ‹کار دفتری: کاری نووسینگەیی›.
**دفتریار** / daftaryār ، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] /*اسم.* دەفتەریار؛ جێگری سەردەفتەر لە دەفتەرخانەدا.
**دفته** / dafte ، ـها/: *اسم. [نساجی]* کەلکیت؛ کەرکیت؛ دەف؛ دەفە؛ هەپک؛ هەپۆ؛ هەپە؛ ئامرازێکی کانزایی و قورس بۆ کوتانەوەی پۆ: **دفتین؛ دفه**
**دفتین** / daftîn/: [از عربی] ☜ **دفته**
**دفزن** / dafzan ، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی]/*اسم. [ادبی]* دەفژەن؛ دەفزەن؛ دەفەلێدەر؛ ژەنیاری دەف.
**دفع** / daf'/: [عربی]/*اسم.* دەران: ۱. دەلەک؛ دەللەک؛ کار یان ڕەوتی دوورەوەکردن، ڕەواندن و ڕانان؛ دەراندن ۲. دەراوی؛ کار یان ڕەوتی تلتە و ڕیخ دانە دەر؛ ڕاداشتن. هەروەها: **دفع شدن؛ دفع کردن**
◙ **دفع فاسد به أفسد کردن:** پیس بە پیس‌تر پاکەوەکردن؛ خراو بە خراوتر ڕانان؛ بە خراپترێک خراپێک لە نێو بردن.
**دفعات** / dafa'āt/: [عربی] جمعِ ☜ **دفعه**
**دفعتاً** / daf'atan/: [عربی] *قید.* ناکاو؛ لەنکاو؛ لەنەکاو؛ یەکجارە؛ یەکهەو؛ گوزوگومەت؛ گزوگومبەت؛ ناگا؛ کوت‌وپڕ؛ لە کتوپڕا؛ لەپڕدا ‹دفعتاً بلند و شد و راه افتاد: لەنکاو هەستا و کەوتە ڕێ›.
**دفعه** / daf'e ، ـها؛ دفعات/: [عربی]/*اسم.* جار؛ کەڕەت؛ ڕا؛ کەشە؛ چەل؛ گلۆنگ؛ گەلانکە؛ هەو؛ هەل؛ حەل؛ دال؛ سەر؛ گل؛ گا؛ بارە؛ وارە؛ دەحە؛ دەفحە؛ ژمارەی ڕووداو یان کارێکی دوو یان چەند پاتەیی ‹چهار دفعه به دیدنت آمدم نبودی: چوار جار هاتم بۆ لات، نەبووی›.
**دفعی** / daf'î/: [عربی] *صفت.* ۱. دەرکردنی؛ ڕانانی؛ دەردانی ۲. دەردراو؛ دوورخراو.
**دفن** / dafn/: [عربی]/*اسم.* ۱. خاک‌سپێری؛ دەفن؛ کار یان ڕەوتی ناشتن؛ ناژتن؛ مردوو تەمراندن؛ بە خاک سپاردن، بەتایبەت تەرمی مردوو ۲. کار یان ڕەوتی شاردنەوە/ شاردرانەوە؛ حەشاردان/ حەشاردران؛ لمتش؛ وەدارتش؛ وەداروتش؛ وەدەتش؛ وەدەرتش؛ وەشاریان یان وەشارتنی شتێک لە ژێر کۆمایێ شتی‌ترەوە، بەتایبەت خاک ‹در زیر تودەی بهمن دفن شده بود: لە ژێر کۆمای هەرەسدا شاردرابووەوە›. هەروەها: **دفن شدن؛ دفن کردن**

**دفه** / dafe/ ☜ **دفته**

**دفیله** / defîle/: [فرانسوی]*اسم.* *[نامتداول]* ڕیـزە؛ ڕزە.

▣ **دفیلەی مـد:** ڕزەی بـاو؛ ڕانـانی بـاو؛ ڕانـوانی مود.

**دفینه** / dafîne ، ـها؛ دفاین/: [عربی]*اسم.* ژێرخاکی؛ گەنج یان شتی بەنرخ کە لە ژێر خاکدایە.

**دق** / deq(q)/: [عربـی]*اسـم.* دێـق/ دیـق: ۱. *[قدیمی]* ژانەزراڤ؛ دەردەباریکـە؛ کـان؛ تـەق؛ نەخۆشی سیل ۲. نەخۆشینێ کە بە هۆی خـەم و خەفـەتی زۆرەوە تووشـی کەسـێک دەبێـت ۳. *[مجازی]* کـوڵوکەسـەر؛ داخ و ئـاخ؛ جـەخار؛ ئالوز؛ خەم و خەفەتی زۆر.

▣ **دق دل** ☜ **دقدلی**

▣ **دق کـردن:** دێـق/ دیـق کـردن؛ بـە هـۆی کـوڵوکەسـەری زۆرەوە تووشـی نەخۆشـین هاتن ‹از شـنیدن خبـر دار زدن دختـرش دق کـرد و مـرد: لـە بیـستنی خەبـەری لـە سـێدارە درانی کچەکەی دیقی کرد و مرد›.

**دق‌الباب** / daqqolbāb ، ـها/: [عربی]*اسم.* *[ادبی]* تەقە؛ کاری لە درگـا دان؛ تەقـە لێـدان؛ دەرگـا کوتـان ‹دق‌البـاب کـرد و منتظر مانـد: تەقـەی دا و چاوەڕێ ما›. هەروەها: **دق‌الباب کردن**

**دقایق** / daqāyeq/: [عربی] جمعِ ☜ **دقیقه**

**دقـت** / deqqat ، ـهـا/: [عربی]*اسـم.* ۱. وردی؛ هویری؛ هێزێکی زەینی کە لە پێکهێنـان یـان وەبەر نان و ئامادەکردنی شتێک، بەتایبـەت بـە ورد بوونەوە لـە وردەکاریەکانیـدا دەکـار چـووە ۲. ڕادەی دروسـتی و تـەبایی شـتێک بـەپێی ئەندازە و پێومانگەلی ڕەچاوکراوەوە ۳. سـەرنج؛ سـەرنجە؛ دێ؛ کـار یـان ڕەوتی لێـروانین و هەڵسەنگاندنی شتێک بە وردی.

▣ **دقـت کـردن:** زەیـنین؛ سـەرنج دان؛ ورد بوونەوە؛ هوور بوونەوە؛ بـە وردی لـێ ڕوانـین؛ بـەکارهێنانی زەیـن، هـزر و بـیر یـان کەرەسـەگەلی سـەنگاندن بـۆ گەیـشتن بـە ئاکامی دروست و ڕەچاوکراو.

**دق‌دلی** / deq(qe)delî ، ـها/: [عربی/ فارسی]*اسم.* *[مجازی، گفتاری]* داخی دڵ؛ داخەدڵی؛ ڕقـی دڵ؛ قینی دڵ؛ تـووڕەیی بـە بۆنـەی دەرد و ڕەنجـی زۆرەوە: **دقّ‌دل**

▣ **دق‌دلـی درآوردن:** داخـی دڵ ڕژانـدن؛ دڵ خاڵی کردنەوە؛ باربووکردنەوەی چەوساوەیی و بێبەشی.

**دق‌دلـی سـر کـسی/ چیـزی خـالی کـردن/ درآوردن/ درکـردن:** *[مجـازی]* داخـی دڵ بـە سەر کەسێ/ شتێکدا خاڵی کردنەوە/ ڕژانـدن؛ دڵێشاوی و تووڕەیی خۆ بە ئازار گەیانـدن بـە کەس یان شتانیترەوە لابـردن ‹دق‌دلـی‌اش را سر ظرفها دراورد: داخی دڵـی بـە سـەر قاپەکانـدا ڕژاند›.

**دق‌کـش** / deqkoš/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت.* زووخاوکوژ؛ زووخاوزگ؛ دێق‌کوژ؛ تووشی مەرگ هاتوو بە هۆی کوڵوکەسـەری زۆرەوە ‹بـا همین کارهایت آخرش مرا دق‌کش می‌کنی: هەر بەم کارانەت ئاخری من زووخاوکوژ دەکەی›.

**دق‌مـرگ** / deqmarg/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت.* *[گفتاری]* داخ‌کـوژ؛ ژانەمـەرگ؛ مـردوو بـە هـۆی دەرد و ڕەنج و خەفەت خواردنی زۆرەوە ‹بعد از اعدام پسرش دق‌مرگ شد: دوای ئێعـدامی کوڕەکـەی داخ‌کوژ بوو›. هەروەها: **دق‌مرگ شدن**

**دقه** / daqqe ، ـها/: *اسم.* *[مکانیک]* پڵتە؛ ترپـە؛ دەنگێک کە بە هۆی باش نەسـووتانی بنـزینی موتورەوە بەدی دێ.

**دقیـــق** / daqîq/: [عربـی] *صـفت.* ڕێـک؛ ورد: ۱. میـزان؛ دووز؛ بـە سـەرنج ‹سـاعت دقیـق: کاتژمێری ڕێک› ۲. ڕێکوپێک؛ هاوگەر لەگـەڵ پێوەرگەلی دیاریکراودا ‹وقت دقیق؛ کار دقیق: کاتی ڕێک؛ کاری ڕێکوپێک›. هەروەها: **دقیق بودن**

▣ **دقیق شدن:** ورد بوونـەوە؛ وردەوە بـوون؛ بـە

سەرنجەوە ڕوانـین و لێکۆڵـینەوە لـە شـتێک ‹وقتی بە صورتش دقیق شدم، او را شناختم: کاتێ کە لە دەموچاوی وردەوە بووم، ناسیمەوە›.

**دقیقـاً** / daqîqan/: [عربی] *قید*. ڕاسـت؛ ڕێـک؛ تـەخت؛ ڕێـکوڕاس؛ بـەوردی؛ بـە ڕاسـتی و دروستی ‹دقیقاً چە گفت؟: دقیقاً چهار کیلومتر بود: ڕاست چی گوت؟؛ ڕێک چوار کیلۆمیتر بوو›.

**دقیقــه** / daqîqe ، ـهـا؛ دقـایق/: [عربـی] *اسم*. ۱. هووردەم؛ خولکە؛ خولـەک؛ دەقیقـە؛ دەقـە؛ دیقـە؛ دەیقـە؛ وردەک؛ یەکـەی پێـوانی کـات بەرانبـەر بـە ٦۰ چرکـە ۲. یـەک لـە شەست(۱/٦۰)ی پلـەک (دەرەجـە) ۳. *[مجازی]* تاو؛ سات؛ دەقیقە؛ دیقە؛ کـاتی زۆر کـەم ‹یک دقیقـە آرام بگیـر: تاوێـک ئـۆقرە بگـرە› ٤. *[ادبی]* چەمکی ڕێکوپێک؛ بابەتی ورد.

**دقیقه‌ای**[1] / daqîqe'î/: [عربی] *صفت*. خولکـەیی؛ خولەکی؛ دەقیقـەیی؛ دیقـەیی؛ پێوەندیـدار بـە دەقیقەوە ‹کار دو دقیقه‌ای: کاری دوو خولکەیی›.

**دقیقه ای**[2]: *قید*. ۱. دیقەیی؛ خولکەیی؛ خولەکی؛ دەقەیی؛ بە پێی دەقیقە ‹دقیقه‌ای پول مـی‌گرفت: دیقـەیی پـارەی وەردەگـرت› ۲. خولکەیـەک؛ خولـەکێک؛ دیقەیـەک؛ دەقیقەیـەک؛ لـە هـەر دەقیقەیەکدا ‹دقیقـه‌ای صد حـرف تایپ مـی‌کـرد: دیقەیەک سەد پیتی تایپ دەکرد›.

**دقیقه شمار** / daqîqešomār/: [عربی/ فارسی] *اسم*. خولەکژمێر؛ دیقەژمار؛ عەقرەبە درێژۆکەی سەر پەڕەی کاتژمێر کە خولەک نیشان دەدا.

**دقیقه‌شماری** / daqîqešomārî/: [عربی/ فارسی] *اسم*. *[کنایی]* چـاوەڕێیی وێـڕای بـزۆزی و بێئۆقرەیی.

**دک** / dak/: *اسم*. *[گفتاری]* سـەر؛ سـەرە؛ کەلـە؛ کەللێ.

▣ **دک شدن:** لە مل بوونەوە؛ لە کـۆڵ بوونـەوە؛ تەمر بوون؛ لە ملەو بوون؛ ڤەچفیان؛ دەرکران؛ ڕتـان؛ قـەوران؛ دەک بـوون؛ هەڵـفرتان؛ بـە نهێنی و نائاشکرایی وەلانران ‹وقتی ارباب دک شد، افتادیم بە جـان پیـشکار: کاتێـک ئاغـا لـە مـاڵ بووەوە؛ کەوتینە گیانی زاوتەکەوە›.

**دک کـردن:** شـەلقاندن؛ لـە ملـەوکردن؛ لـە کـۆڵکردنـەوە؛ تـەمر کـردن؛ قەورانـدن؛ ڤەچفاندن؛ ڕتاندن؛ هەڵـفرتاندن؛ هەڵـفرتانن؛ چفاندن؛ قەشتاندن؛ هەڵـپرتاندن؛ وەدەرنـان؛ بەرپرنای؛ ڕەڤـاندن؛ ڕەوانـدن؛ قەڵـتاندن؛ بـە فـێڵ و تەڵـەکە لـە جێگایـەک دوورکردنـەوە ‹چقـدر زور زدیـم تـا او را دک کـردیم: چـەن پەلوپۆمان کرد تا لە ملمان کردەوە›.

**دکـاگرم** / dekāg(e)ram/: [فرانسوی] *اسم*. دیکاگرەم؛ یەکەی ئەندازەگیری پێـوانی کـێش بەرانبەر بە ۱۰ گرەم.

**دکـالیتر** / dekālîtr/: [فرانسوی] *اسم*. دیکـالیتر؛ یەکـەی ئەنـدازەگیری بارسـتایی بەرانبـەر ۱۰ لیتر.

**دکامتر** / dekāmetr/: [فرانسوی] *اسم*. دیکـامیتر؛ یەکەی پێوانی درێژایی بەرانبەر ۱۰ میتر.

**دکـان** / dok(k)ān ـهـا؛ دکـاکین/: [عربـی] *اسم*. دووکان؛ دوکان: ۱. هۆدەیێ لـە سـەر گـوزەری گشتیەوە بۆ ڕانـانی کـاڵا یـان ڕاژەی پێویـستی خەڵک ۲. *[مجازی]* ڕێگای دابین کـردنی داهـات بە شێوەی نـادرووس و نـەگونجاو ‹آقا، این کـە مدرسە نیست، دکان است: کاکە، ئەمە قوتابخانـە نیـە، دووکانە›.

▣ **دکان کـسی تختـه شـدن:** *[کنایی]* ۱. کـاری کەسێک خەوتن؛ کـاری کەسـێک ڕاوەسـتان ۲. لـە برەوکـەوتنی کـاری کەسـێک؛ کـاری کەسێک کەساد بوون ‹با آمـدن کـامپیوتر دکـان حروفچینها تختە شد: بـە هاتنی کۆمپیۆتەر کـاری پیتچنەکان لە برەوکەوت›.

**دکاندار** / dokāndār ، ـهـا؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی] *اسم*. دووکاندار؛ دوکاندار؛ خاوەن دوکان.

**دکتر** / doktor ، ـهـا/: [فرانسوی] *اسم*. دوکتـور؛

دکتۆر: ۱. بژیشک؛ پزشک؛ حەکیم ۲. دەواساز؛ دەرمان چێکەر ۳. کەسێک کە لە بوارێکی زانستیدا بانترین پلەی زانستگایی هەیە.

**دکترا** / doktorā/: [فرانسوی] /اسم. دوکتورا؛ دەرەجەی دوکتوری ‹دکترای ادبیات: دوکتورای ویژەوانی›.

**دکترس** / doktores/: [فرانسوی] /اسم. *[نامتداول]* خانم دوکتور؛ ژنێ کە پلەی دوکتوری هەیە.

**دکتری** / doktorî/: [فرانسوی] /اسم. دوکتوری: ۱. چۆنیەتی دوکتور بوون ۲. دوکتورا؛ پیشە یان پلەکی دوکتور.

**دکترین** / doktorîn، ـها/: [فرانسوی] /اسم. ئامۆژە؛ ڕێباز؛ کۆمەڵەی بنەماگەلی فێرکاری پێوەندیدار بە بابەت، کەس یان ڕێبازێکی دیاریکراوەوە.

**دکستروز** / dekst(e)roz/: [فرانسوی] ☜ **گلوکز**

**دکل** / dakal، ـها/: /اسم. دەکەڵ؛ دیکەڵ؛ دیگەڵ؛ دیگەڵە؛ ئەستۆن؛ هوستون: ۱. کۆڵەکەی گەمیە؛ کۆڵەکەیەکی ئەستوونی لە سەر کەشتی، بۆ هەڵدانی بادەوان و لار و سەنگی ڕاداشتنی ۲. دیرەگ؛ پێکهاتەیەکی ئەستوونی و بەرز و باریک لە چێو یان کانزا بۆ هەڵکێشانی شتومەک ۳. کۆڵەکە؛ پێکهاتەیەکی ئەستوونی بەرز لە چێو یان کانزا بۆ ڕاگرتن و پارازتنی شتێک لە بەرزایی پێویستدا.

**دکلره** / dekolore/: [فرانسوی] *صفت.* ڕەنگلێسراو؛ بێڕەنگ بوو؛ کاڵەوبووگ؛ بێڕەنگکراو؛ ڕەنگسڕاو.

**دکلمه** / deklame، ـها/: [فرانسوی] /اسم. دیکلەمە؛ کار و ڕەوتی خوێندنەوەی بەرهەمێکی ویژەیی بە حالەتێکی کارا.

**دکمه** / dokme/: [ترکی] ☜ **تُکمه**

**دکوپاژ** / dekopāj، ـها/: [فرانسوی] /اسم. دیکۆپاژ؛ کار و ڕەوتی دابەش بوونی فیلمنامە بە پێی بەش و نماگەلی جۆراوجۆرەوە.

**دک‌وپوز** / dak-o-pûz/: /اسم. *[تعریض]* ۱. دەم و فلچ؛ دەم و قەپۆز؛ دەم و لەوس؛ چڕ و چەناکێ؛ دەم و فلق ‹می‌زنم دک و پوزت را خرد می‌کنم: لێت دەدەم دەم و فلچت دێنمە یەک› ۲. دیامان؛ سیما؛ تەحر؛ بیچم؛ چڕ و چاو؛ تووز.

**دک‌ودنده** / dak-o-dande/: /اسم. *[گفتاری]* شان و پەراسوو؛ سەر و سینگ ‹دک و دنده‌ی پیرمرد را شکست: شان و پەراسووی پیرەمەردەکەی شکاند›.

**دکور** / dekor، ـها/: [فرانسوی] /اسم. دیکۆر؛ ڕازە: ۱. کەلەبدون؛ ئەوەی بۆ خەملاندنی جێگایەک (وەک شانۆ، ژوور، نووسینگە و...) و دەرهێنانی بە شێوازی دڵخواز بە کار دەبرێ ۲. پەردە یان قاپێکی گەورە کە وێنەی تێدا کێشراوە و بۆ ڕازاندنەوەی شانۆ بە کار دەڕوا ۳. شتێ کە لایەنی نومایشی هەیە و هەر بە مەبەستی بەدیهێنانی ڕوانینێکی تایبەت لە بینەردا بە کار دەبرێ ‹این کتابخانه دکور است و اینجا کسی کتاب نمی‌خواند: ئەم کتێبخانەیە دیکۆرە و کەس لێرە کتێب ناخوێنێ›.

**دکوراتور** / dekorātor، ـها/: [فرانسوی] /اسم. ڕازێنکار؛ ڕازێنەر؛ دیکوراتۆر: ۱. بەرهەڤکری شاشەی شانۆ ۲. ئەوی کە جێگایەک دەڕازێنێتەوە.

**دکوراتیو** / dekorātîv/: [فرانسوی] *صفت.* ئارایشتی؛ ڕازاندنەوەیی؛ پێوەندیدار بە ڕازاندنەوەوە.

**دکوراژه** / dekorāje/: [فرانسوی] *صفت.* دڵسارد؛ دڵسەرد؛ دڵسار.

**دکوراسیون** / dekorās(i)yon، ـها/: [فرانسوی] /اسم. دیکوراسیون؛ ڕازێنی: ۱. کار، ڕەوت، زانست یان هونەری ڕازاندنەوەی جێگایەک ‹آرام کارشناس دکوراسیون داخلی است: ئارام کارناسی دیکوراسیونی ناوەکیە› ۲. کەلەبدون؛ شت یان شتگەلێک کە بۆ ئارایشتی شانۆ بە کار دەڕوا ۳. ڕازاندنەوەی ناوەوەی ماڵ ‹دکوراسیون خانه‌ات

را عـوض کـردەای؟: دیکوراسیۆنـی ماڵـەکەت گۆڕاوە؟›.

**دکه** / dakke ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. هۆلک؛ دەکە؛ هۆدەیەک لـە پـەنای پیادەڕۆدا کـە ڕۆژنامـە و وردەشتی لێ دەفرۆشن ٢. دوکانۆکە؛ دوکانچـە؛ دوکـانی بچکۆلـە ٣. پـساتی دەسفرۆشـی بـە شێوەی تەخت یان مێزێکی وردەواڵـە لـە سـەر چنراو.

**دکـەدار** / dakkedār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. دەکـەدار؛ هۆلکـدار؛ کەسـێ کـە خـاوەنی دەکەیەکە و لەوێدا کار دەکا.

**دگـر** [1] / degar/: صفت. [مخفف] دی؛ تـر؛ تـەر؛ دیکە؛ دیتر ‹بارِ دگر بهار شد: جارێکیتر بـوو بـە بەهار›.

**دگر ـ** [2]: قید. دیسان؛ ئیتر؛ ئـەیتر؛ ئێتـەر؛ ئێتـر؛ هەمدیس؛ هەمیسان؛ هەمدی؛ هەمتر؛ هەمتـەر ‹دگر بگوی: دیسان بێژە›.

**دگر ـ** [3]: پیشواژە. ـ نوێ؛ ـ جیاواز؛ جیاـ ؛ جۆرێکی جیاواز ‹دگراندیش: بیرنوێ›.

**دگرانـدیش** / degarandîš ، ـها؛ ـان/: صفت. بیرجیـاواز؛ خـاوەن بیرێکـی جیـاواز لەگـەڵ ئەندێشەی زاڵ بە سەر کۆمەڵگا یان گرۆیەکـدا. هەروەها: **دگراندیشی**

**دگربـار** / degarbār ، ـها؛ ـان/: قید. جـارێتـر؛ جارێکیتر؛ ڕایێتر؛ ڕایێکیتر؛ جارێوتەر؛ دووبارە. هەروەها: **دگربارە**

**دگرباورسـازی** / degarbārvarsāzî/ ☜ **دگرباروری**

**دگربـاروری** / degarbārvarî ، ـها/:اسم. [زیستشناسی] ڕەوتی بەبەرکردنـەوە؛ بـەردار کردنـەوە؛ بەرگرکردنـەوە؛ تێکـەڵاو بـوونی گانەگەلی نێر و مای کەسانی جیاوازی سـەر بـە گۆنەیەک: **دگرباورسازی؛ دگرگشنی**

**دگربـافتی** / degarbāftî/:اسم. [زیستشناسی] گۆڕانی بیچمی شانەیەک بۆ شانەیەکیتـر (وەک گۆڕانی کرۆژە بە ئێسک): **دگرسازی**

**دگردیسی** / degardîsî ، ـها/:اسم. [زیستشناسی] چەرخەی گۆڕانی لە پەسـتای گیانـەوەرێک لـە ساواییەوە تا جحێـلی کـە هاوڕێیـە لەگـەڵ لـە دەست دان یان بە دەست هێنانی ئەندامانێک.

**دگرسازی** / degarsāzî/ ☜ **دگربافتی**

**دگرسانی**/ degarsānî/ ☜ **دگرشکلی**

**دگرشـکلی** / degaršeklî ، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. [زیستشناسی] هەر یەکە لە تایبەتمەندیگەلی دوانەی دایک و بابی کە دژ بەیەکن و یەکێکیان لە گیانەوەردا دەبینێندرێتەوە (وەک بەرزی و نزمی بـاڵا، ڕەنگـی چـاو و ...): **دگرسـانی**. هـەروەها: **دگرشکل؛ دگرسان**

**دگرگشنی** / degargošnî/ ☜ **دگرباروری**

**دگرگـون** / degargûn/: صفت. [ادبی] گـۆڕاو؛ گۆڕدراو؛ واڕیا؛ بە دۆخ یان چۆنیەتیەکی جیـاواز لەگـەڵ دۆخ یـان چۆنیـەتی پێـشوودا ‹رنگـش دگرگون شد: ڕەنگـی گـۆڕا›: **دیگرگـون**. هـەروەها: **دگرگون بودن؛ دگرگون شدن؛ دگرگون کردن**

**دگرگونگی** / degargûnegî/:اسم. گۆڕانکـاری؛ گۆڕدراوی: ١. دۆخ یان چۆنیـەتی گـۆڕاو بـوون ‹انقلاب موجب دگرگونگی جامعه شد: ڕاپەڕین بـوو بـە هۆی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگادا› ٢. کار یـان ڕەوتی گۆڕان.

**دگرگونه** / degargûne/: صفت. [ادبی] گـۆڕدراو؛ گۆڕاو؛ گۆڕیاگ؛ واڕیـا؛ بـە دۆخ یـان بیچمێکـی گۆڕاوەوە ‹هنگامی که به شهر خود بازگشت، وضع را دگرگونه یافت: کاتێ گەڕایـەوە بـۆ شارەکەی، بـار و دۆخێکی گـۆڕدراوی بـینی›. هـەروەها: **دگرگونـە بودن؛ دگرگونه شدن؛ دگرگونه کردن**

**دگرگونی** / degargûnî ، ـها/:اسم. گۆڕانکـاری؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی گـۆڕان؛ گۆڕیـان؛ واڕیـەی؛ واڕیای ‹انقلاب موجب دگرگونی جامعـە شد: شـۆڕش بوو بە هۆی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگادا›.

**دگروار** / degarvār/:اسم. چەنـد بـیچم؛ هـەر

یەکـە لـە بیچمگـەلی جیـاوازی تـوخمێکی شیمیایی (وەک کەربون کـە لـە بیچمـی سـوخاڵ، گرافیت و ئەڵماسدایە).

**دگروارگـــی** / degarvāregî/: *اسـم.* چەنـد بیچمی؛ چۆنیەتی چەند بیچم بوون.

**دگم**[1] / dogm/: [فرانسوی] *اسم.* دوگم؛ بێ قسە؛ ئەوەی وەک بنەمایەکی سەرەکی وەرگیراوە و جێگای هیچ قسە و باسێکی تێدا نیە.

**دگم**[2] *ـ‌ها/: صفت.* دوگم؛ وشک؛ بیروشک؛ بەسـراو؛ گرسـاو؛ خـاوەن ئـۆگرەتی بـە ئەندێشەگەلی نەگۆڕ.

**دگماتیـسم** / dogmātîsm/: [فرانـسوی] *اسـم.* بیروشکوازی؛ سەرهشکی؛ نەگۆڕی؛ بیروشکی.

**دگماتیـک** / dogmātîk/: [فرانـسوی] *صـفت.* دوگماتیک؛ وشک؛ بیروشک؛ بیروشکواز.

**دگمه** / dogme/: [ترکی] ☜ **تُکمه**

**دگنک** / dagank ، ـها/: [ترکـی] *اسم. [گفتـاری]* کوتـەک؛ داردەس؛ دارەدەسـت؛ گۆپـاڵ؛ زۆلاخ؛ تێلا؛ زنج؛ زۆپ؛ گود؛ زۆپک؛ زۆپا؛ زۆپـە؛ کۆپـار؛ کوپار؛ کۆپاڵ.

**دل** / del/: *اسم.* دڵ: ١. ـ‌ها/ قـەلب؛ ئەنـدامی هلۆڵی ماسوولکەیی لەشی زۆرینەی گیانەوەران کە بە پشکووتن و وێکهاتنی (زۆرتر) یەک جۆر و پەیتاـپـەیتا، خـوێن دەگەیێنێتـە لەشـەوە ٢. *[گفتاری]* زێڵ؛ لەمە؛ سـک؛ زگ؛ زک ‹دل درد؛ سر دلم سنگین است: سک ئێشە؛ سەر دلـم قورسـە› ٣. *[مجـازی]* جەرگە؛ ناو؛ نێو؛ ناخ؛ ناوەنـد؛ دلـێ؛ چۆنگ؛ چەق یان ناوەڕاسی هەر شـتێک ‹در دل شب؛ در دل تاریکی: لـە دلـی شـەودا؛ لـە جەرگـەی تاریکاییدا› ٤. *[مجـازی]* ئـەو بەشـەی زەیـن کـە پێوەنـدی لەگـەڵ عاتیفـە و هەسـتدایە: *الـف)* ئەوین؛ میهر؛ دۆستایەتی ‹دل بردن؛ به دل نشستن: دل بردن؛ بە دلەوە نیشتن› *ب)* جەرگ؛ ئازایەتی؛ زات؛ بوێری ‹پردل؛ دل کاری را داشتن: بـەجـەرگ؛ زاتـی کارێک هەبوون› *ج)* هۆگرەتی ‹دل به کـاری بستن: دل به کارێک خـۆش کـردن› *د)* ئەنـدازەی هەستۆکی لە بەرانبـەر ڕەنجـی کەسـانیتـرەوە ‹نـازکدل: دڵناسـک› ٥. نادیـارترینی هەستونەستان ‹از دل کسی خبر داشتن: لـە دلـی کەسێک ئاگادار بوون› ٦. ـ‌ها/ یەکێک لـە چـوار نەخـشی وەرقبـازی ٧. نمانـای ئـەوین وەک ژمارەی «٥»ی بەراوەژۆ.

◘ **دل خوش:** *[مجازی]* دڵی خۆش؛ دلـی وەش؛ دڵی شاد؛ ڕۆحیەیەکی شاد و بە دوور لە کوڵ و کەسـەر ‹مهمـانی رفـتن دل خـوش مـیخواهـد: میوانی چوون دلی خۆشی دەوێ›.

**دل سیر:** *[مجازی]* تێر و تەسەل؛ تێر و پڕ؛ پـڕ بە دڵ؛ تا بە دەست هێنـانی ڕەزامەنـدی دڵ ‹یک دل سیر تماشایش کردم: تێر و تەسەل سەیرم کرد›.

**از ته دل:** *[کنایی]* لە ناخی دڵەوە؛ لـە کانگـای دڵــەوە؛ پـڕ بـە دڵ ‹از تـە دل بـرایش آرزوی خوشـبختی کـردم: لـە نـاخی دڵـەوە داوای خۆشبەختیم بۆی کرد›.

**از دل و جان:** *[کنایی]* بـە دڵ و گیـان ‹از دل و جان برایش کار کردم: بە دڵ و گیان کارم بۆ کرد›.

**در/ توی دل:** *[کنایی]* لە دڵەوە؛ لە دلا؛ دڵـەنە؛ ئەنەدڵ؛ لای خۆوە؛ لەگەڵ خـۆدا ‹در دل بـه او نفرین میکرد: لە دڵەوە تووکی دەکرد›.

◘ **دل از دست دادن:** *[مجـازی]* دڵ دانـان؛ زۆر ئەویندار بوون ‹همـان روز دل از دسـت داده بـود: هەر ئەو ڕۆژە دلی دانابوو›.

**دل از کسی بردن:** *[مجـازی]* دڵ لـە کەسـێک ڕفاندن؛ ئەویندارکردن؛ دڵ بـردن؛ دڵ دزیـن ‹با زیبایی خود از همه دل برده بود: بە جوانی خـۆی دلی لە هەموو ڕفاندبوو›.

**دل باختن:** *[مجازی]* دڵ دانان؛ ئەویندار بـوون؛ عاشق بوون.

**دل برای کسی سوزاندن:** *[مجـازی]* دلسوزی کردن ☜ **دلسوزی**

**دل به چیزی/ کسی بستن:** *[کنایی]* ١. بە آن/او امید بستن ☜ **امید** ٢. دلبستە بودن ☜ **دلبستە**

**دل به چیزی خوش کردن:** دڵ بە شتێک خۆش‌کردن؛ دڵخۆش بوون بە شتێکەوە.

**دل به دریا زدن:** *[مجازی]* چش لێ‌کردن؛ چش لە هەموو شتێ کردن؛ بۆ کردنی کارێک خۆ خستنە مەترسیەوە ‹دل به دریا زدم و عازم سفر شدم: چشم لێ‌کرد و تەیاری سەفەر بووم›.

**دل به دل راه داشتن:** *[کنایی]* دڵ ئاوێنەی دڵ بوون؛ دڵ ئاگای لە دڵ بوون؛ میهرەبانی و دۆستایەتی لە دوولایەنەوە بوون ‹راست می‌گویند دل به دل راه دارد: ڕاستە دەڵێن دڵ ئاوێنەی دڵە›.

**دل به دل کسی دادن:** *[مجازی]* دڵ بە قسەی کەسێک دان؛ دڵ دانە کەسێک؛ هاودڵی لەگەڵ کەسێک‌کردن؛ نیشاندانی هۆگرەتی و خوازیاری بۆ بیستنی قسەی کەسێک ‹زیاد دل به دل این پسر نده، پررو می‌شود: هێندە دڵ مەدەرە ئەو کوڕەوە ڕوودار دەبێ›.

**دل به کاری دادن:** *[کنایی]* دڵ دانە کارێکەوە؛ شان بۆ کارێک شل‌کردن؛ خۆ بە کارێک دان؛ بە هۆگرەتیەوە کارێک‌کردن ‹اگر دل به کار بدهی زود یاد می‌گیری: ئەگەر دڵ بدەیتە کارەوە زوو فێری دەبی›.

**دل به کسی دادن:** *[کنایی]* دڵ بە کەسێک دان؛ ئەویندارى کەسێک بوون؛ عاشق کەسێ بوون ‹دل به تو دادم که یارم باشی: دڵم پێدای کە بیتە یارم›.

**دل پُری داشتن:** *[مجازی]* دڵ‌پڕ بوون؛ دڵمەند بوون؛ زۆر ڕەنجاو و گەهراو بوون ‹از تو دل پری داشت: دڵی پڕ بوو لێت›.

**دل توی دل کسی نبودن:** *[مجازی]* دڵ لە مشتی کەسێکدا بوون؛ دڵ نەمان؛ بە دڵەخۆرپێ/ دڵەتەپێ بوون؛ دڵ لە لا نەمان؛ تووشی دڵەڕاوکە و نیگەرانی بوون ‹دل توی دلم نبود: دڵم لە مشتمدا بوو›.

**دل خواستن:** دڵ پێوە بوون؛ دڵ پوەوە بیەی؛ دڵ ویستن؛ دڵ خواستن؛ دڵ گەرەک بوون؛ دڵ واسەی؛ بە ئاوات بوون؛ پێ‌دڵخواز بوون؛ حەزکردن؛ دڵ چوونە سەر؛ خوازیار و بە ئاوات بوون ‹دلم می‌خواست بودی و می‌دیدی: دڵم پێوە بوو ببوای و بتدیبا›.

**دل (خود را) با کسی صاف کردن:** *[مجازی]* دڵ (خۆ) لەگەڵ کەسێکدا پاک‌کردنەوە: ١. چیتر لە کەسێک شەمزاو و دڵمەند نەبوون ‹با او دلت را صاف کن: دڵت لەگەڵیدا پاک کەوە› ٢. لەگەڵ کەسێکدا میهرەبان و نێزیک بوون.

**دل خود را خالی کردن:** *[کنایی]* خۆ خالی‌کردنەوە؛ دڵ خالی‌کردنەوە؛ وتنەوەی جخار و کوڵوکەسەری خۆ؛ گۆشەی دڵ کردنەوە ‹حرف بزن، دلت را خالی کن: قسە بکە، خۆت خالی کەوە›.

**دل خود را صابون زدن:** *[مجازی]* دڵی خۆ خۆش‌کردن؛ خۆ خۆش کردن؛ دڵ تاودان؛ بێهۆ بە شتێک هیوادار بوون ‹دل خود را صابون زده بودیم که ما را می‌بری گردش: دڵی خۆمان خۆش‌کردبوو کە ئەمانبەی بۆ سەیران›.

**دل خوش کردن:** دڵ‌خۆش‌کردن؛ دڵ وەش‌کەردەی: ١. شادکردن ٢. هیوادار کردن؛ بەتەما کردن.

**دل دادن به کسی:** *[کنایی]* دڵ بە کەسێک دان؛ دڵ وەبەر کەسێک نان؛ بە کەسێک ئازایەتی و بوێری دان ‹هی به خودم دل می‌دادم که نترس، چیزی نیست: هەر دڵم بە خۆ دەدا وە مەترسە، هیچ نیە›.

**دل دادن و قلوه گرفتن:** *[تعریض]* سەر بە سەری یەکترەوە نان؛ پێکەوە لنگ ڕاکێشان؛ سەر یەکتر بردنە دەما؛ وتووێژی زۆر دۆستانە لە نێوان دوو کەسدا هەبوون ‹دو برادر

دل داده بودند و قلوه می‌گرفتند: دوو برا سەریان بە سەری یەکترەوە نابوو›.

**دل داشتن:**/گفتاری/ ١. (خاوەن) دڵ بوون؛ بە ڕۆحم بوون؛ ڕەحمین بیەی؛ خاوەن هەست و بەزەیی بوون ‹مگر آزاد دل ندارد: مەگەر ئازاد دڵی نیە› ٢. بە جەرگ بوون؛ بە دڵ و جەرگ بوون؛ ئازا و بوێر بوون ‹خیلی دل داری کە این کارها را می‌کنی: زۆر بە جەرگی کە ئەم کارانە دەکەی›.

**دل-دل کردن:** پاوپاکردن؛ ئەمپا و ئەوپا کردن؛ ڕاڕایی کردن؛ تووشی دڕدونگی و دوودڵی بوون.

**دل راه ندادن:**/کنایی/ دڵ پێوە نەبوون؛ دڵ نەبیەی پوەوە/ پوە؛ دڵ ڕێ نەدان؛ وەبەر دڵ نەکەوتن؛ هۆگرەتی و خوازیاری دەروونی نەبوون.

**دل سنگ آب شدن:**/مجازی/ بەرد تاوانەوە؛ کافر بەزەیی پێدا هاتن؛ زۆر دڵتەزێن بوون؛ بە دۆخێکی زۆر هەست بزوێن و ناخۆشەوە بوون ‹از دیدن آن منظره دل سنگ اب می‌شد: بە دیتنی ئەو دیمەنە دڵی بەرد دەتاویەوە›.

**دل شیر داشتن:**/مجازی/ دڵی شێر هەبوون؛ بە جەرگ بوون؛ دل زەخم بوون؛ زۆر ئازا و نەترس بوون.

**دل کاری را نداشتن:**/کنایی/ توانای کارێک لا نەبوون؛ نەوێران؛ زات نەبوون؛ دڵی کارێک لا نەبوون؛ ئازایەتی و توانایی کارێک لا نەبوون ‹من دل دیدن این حادثه را ندارم: من توانای دیتنی ئەم کارەساتەم نیە›.

**دل کسی آب شدن:**/مجازی/ دڵی کەسێک دەرهاتن؛ بێئارام و قەرار بوون لە بەر ویستنی شتێک ‹زود باش! دل بچه آب شد: زووبە! دڵی منداڵەکە دەرهات›.

**دل کسی آتش گرفتن:**/مجازی/ گڕ بەر بوونە هەناوی کەسێکەوە؛ کزە لە دڵی کەسێکەوە هەستان؛ پەژارە داگرتن؛ زۆر خەمین بوونی کەسێک ‹از شنیدنش دلم آتش گرفت: لە بیستنی گر بەر بووە هەناوم›.

**دل کسی آشوب شدن:**/کنایی/ دڵی کەسێک هەڵشێوان؛ دڵی کەسێک بە یەکدا هاتن؛ دل کازین؛ دڵ تێکەڵاتن؛ دڵوو یۆی تێک شیەی؛ کەوتنە هێڵنجدانەوە ‹از دیدن آن همە کثافت دلش آشوب شد: لە بینینی ئەو هەموو پیسیە دڵی هەڵشیوا›.

**دل کسی آرام گرفتن:** دڵی کەسێک سوکنایی گرتن؛ سوکنایی بۆ کەسێک هاتن؛ دڵی کەسێک دامەزران؛ ئارخەیان بوونی کەسێک؛ دڵنیا بوونی کەسێک؛ دڵو یووی سرەوای؛ دڵ داسەکنان؛ دڵ‌بجێ بوون؛ دڵ ڕوون بوون ‹با دیدن پسرش دلش آرام گرفت: بە بینینی کوڕەکەی سوکنایی هات›.

**دل کسی آمدن:**/کنایی/ دڵی کەسێک هاتن؛ دڵی کەسێ بەرایی دان؛ زێڵوو یۆی ئامەی؛ ڕازی بوونی کەسێک (ڕاڤە: زۆرتر بە شێوەی نەرێنی بە کار دەڕوات) ‹دلش نیامد بچە را دست‌خالی برگرداند: دڵی نەهات منداڵەکە هەروا بگەڕێنێتەوە›.

**دل کسی از جا کنده شدن:**/مجازی/ دڵی کەسێک داکەوتن؛ دڵی کەسێک نەمان؛ تۆقای؛ دڵوو یۆی کەوتەیرە؛ زۆر ترسان ‹یک دفعە دلم از جا کندە شد: ناکا دلم داکەوت›.

**دل کسی باز شدن:**/مجازی/ دڵی کەسێک کرانەوە؛ دڵوو یۆی کریایوە؛ دەرباز بوونی کەسێک لە کوڵ و کەسەر ‹کمی گرداندمش، بلکە دلش باز شود: کەمێ گەڕاندم، بەڵکوو دڵی بکریتەوە›.

**دل کسی با کسی صاف نبودن:**/مجازی/ لە کەسێ دڵ‌کرمۆڵ بوون؛ لەگەڵ کەسێک یەکدڵ نەبوون؛ لە کەسێک دڕدونگ یان دڵشێلاو بوون ‹دل آرام هیچ وقت با تو صاف نبود:

ئارام هەمیشە لە تۆ دڵ کرمۆڵ بوو›.

**دل کسی برای چیزی لک زدن:** *[مجازی]* دڵی کەسێ بۆ شتێک کورکە کردن/ دەرهاتن؛ دڵبزۆک بوونی کەسێک بۆ شتێک؛ دڵی کەسێک بۆ شتێ/ کەسێ تۆقلە کردن.

**دل کسی برای کسی/ چیزی پرپر زدن:** *[مجازی، گفتاری]* دڵی کەسێ بۆ کەسێ/ شتێک پەڕ دەرکردن/ فڕین؛ دڵی کەسێک بۆ کەسێ/ شتێک دەرهاتن؛ زۆر بە ئاواتەوە بوون (بۆ کەسێ/ شتێ)؛ دڵسووتاوی کەسێ/ شتێک بوون؛ دڵی کەسێ بۆ کەسێ/ شتێک لێدان ‹دل دختر برای دیدن پدرش پرپر می‌زد: دڵی کچەکە بۆ دیتنی بابی دەفری›.

**دل کسی برای کسی یک ذره شدن:** *[مجازی]* زۆر بە تاسەی کەسێکەوە بوون؛ زۆر خوازیاری بینینی کەسێک بوون ‹کجا بودی؟ دلم برایت یک ذره شده بود: لە کوێ بووی؟ زۆر بە تاسەتەوە بووم›.

**دل کسی به حال کسی سوختن:** *[مجازی]* دڵی کەسێ بۆ کەسێک سووتان؛ بە بۆنەی کەسێکەوە خەمین بوون؛ بەزەیی بە کەسێکدا هاتنەوە ‹دل همه به حالش سوخت: هەموو دڵیان بۆی سووتا›.

**دل کسی به درد آمدن:** *[کنایی]* دڵی کەسێک هاتنە ژان؛ دڵی کەسێک هاتنە کوڵ؛ دڵی کەسێک بوونە بریان؛ خەمین و نارەحەت بوونی کەسێک ‹از دیدن رنج آوارگان دل ما هم به درد آمد: لە بینینی ڕەنج و ئازاری تراقیەکان دڵمان هاتە ژان›.

**دل کسی به رحم آمدن:** بەزەیی بە کەسێکدا هاتنەوە؛ لە زیز بوونی کەسێک نارەحەت بوون ‹دل مهمانها به رحم آمد و به او کمک کردند: میوانەکان بەزەییان پیدا هاتەوە و یارمەتیان دا›.

هەروەها: **دل کسی را به رحم آوردن**

**دل کسی به قیلی‌ویلی افتادن** *[مجازی]* ☜

**دل کسی غنج زدن**

**دل کسی (به) هزار راه رفتن:** *[مجازی]* دڵی کەسێک بە هەزار لادا چوون؛ بە بۆنەی نیگەرانییەوە بیری جۆراوجۆر کردنەوە ‹دیر کردی و دل ما (به) هزار راه رفت: دێر هاتی و دڵمان بە هەزار لادا چوو›.

**دل کسی به هم خوردن:** *[کنایی]* دڵی کەسێک هەڵشێوان؛ دڵزڤرین؛ دڵ تێکەڵاتن؛ دڵی کەسێ هاتنە یەکا؛ جەرگ و دڵی کەسێ بەیەکدا هاتن؛ دڵی کەسێک تێکەڵاتن؛ دڵوو یۆی تێک شیەی؛ دڵکازین؛ تووشی دڵشێواوی بوون ‹داشت دلم به هم می‌خورد: خەریک بوو دڵم هەڵدەشێوا›.

**دل کسی پایین/ فرو ریختن** *[مجازی]* ☜ **دل کسی ریختن**

**دل کسی پوسیدن:** *[مجازی، گفتاری]* دڵی کەسێک پەژمران؛ دڵی کەسێ داگیران؛ دڵ کەسێ مردن؛ دڵی کەسێک تەمران؛ تووشی کەسەر و دڵتەنگی بوون ‹توی این خانه دل زنت پوسید: لەم ماڵەدا دڵی ژنەکەت پەژمرا›.

**دل کسی پیش کسی گیر کردن:** *[مجازی]* دڵی کەسێک لای کەسێکەوە بەند بوون؛ دڵی کەسێک گیرۆدەی کەسێک بوون ‹دلش پیش آن دختر گیر کرده بود: دڵی لای ئەو کچە بەند بوو›. هەروەها: **دل کسی پیش کسی بودن**

**دل کسی تاقچه نداشتن:** *[مجازی]* دەم نەوێساو بوون؛ دەمی کەسێ تەقەڵی پێوە نەبوون/ قایم نەبوون؛ ڕازدار نەبوونی کەسێک.

**دل کسی تپیدن:** دڵی کەسێ لێدان؛ زۆرتر بوونەوەی کوتەی دڵ بەتایبەت لە کاتی دڵەڕاوکەدا ‹دل سارا به شدت می‌تپید: دڵی سارا بە توندی لێیدەدا›.

**دل کسی ترکیدن:** *[مجازی]* ۱. دڵ گیران؛ زۆر خەمگین و دڵتەنگ بوون ۲. دڵ ترەکیان؛ زۆر ترسان؛ تۆقیان؛ زیق‌کردن؛ دڵ لەت بوون؛

دڵوو یۆی چیاوە بیەی.

**دل کسی تنگ شدن:** *[مجازی]* دڵی کەسێک گیران ☜ **دلتنگ**

**دل کسی مثل سیر و سر که جوشیدن:** *[مجازی]* کەوتنە دڵەفرکێ/ دڵەڕاوکێ؛ زۆر نیگەران بوون ‹دلم مثل سیر و سرکه می‌جوشید: کەوتبوومە دڵەفرکێ›.

**دل کسی چرکین شدن:** *[مجازی]* دڵی کەسێک کرمۆڵ بوون ☜ **دلچرکین**

**دل کسی خنک شدن:** *[مجازی]* شاوەکامی هاوردن؛ دڵی کەسێک فێنک بوونەوە؛ ئۆخەی کردن؛ خۆشحاڵ بوون بە هۆی ڕەنج یان گەزن دیتنی دوژمنەوە ‹وقتی خانه‌ی حاجی را دزد زد، دل همسایه‌ها خنک شد: کاتێ ماڵی حاجیان تاڵان کرد، دراوسێکان شاوەکامیان هاورد›.

**دل کسی درد کردن:** *[گفتاری]* سکی کەسێک ئێشان؛ ناو سکی کەسێ ئێشان؛ لەمۆ یۆی مدرەی گیر.

**دل کسی را آب کردن:** *[مجازی]* دڵی کەسێک دەرهێنان؛ کەسێک زۆر ئاواتخواز و خوازیار کردن ‹زود باش بگو، دل همه را اب کردی: زوو کە بێژە، دڵی هەمووت دەرهێنا›.

**دل کسی را آزردن** ☜ **دل کسی را سوزاندن**

**دل کسی را به درد آوردن** ☜ **دل کسی را سوزاندن**

**دل کسی را به دست آوردن:** *[کنایی]* دڵی کەسێک بەدەست هێنان؛ دڵخۆش کردنی کەسێک؛ بە کار و ڕەوتاری خۆ دڵی کەسێک بەرەو لای خۆ هێنان ‹آن‌قدر حرف زدم تا دل او را بدست آوردم: ئەوندەم قسە تا دڵیم بەدەست هینا›.

**دل کسی را ربودن:** *[مجازی، ادبی]* دڵی کەسێک بردن؛ دڵی کەسێک ڕفاندن؛ دڵی کەسێک دزین؛ دڵی کەسێک سەندن/ سەنن؛ دڵی کەسێک کێشان؛ دڵ جە یۆی ساناي؛ دڵ کەسێ بەرەو خۆ کێشان؛ شەیدا و ئەویندارکردنی کەسێک.

**دل کسی را زدن:** *[مجازی]* دان لە دڵی کەسێک؛ کەسێک وەڕەزکردن؛ دەماخی کەسێک پروانن؛ دوزاخە دان؛ دڵوو یۆی کەیل‌کەردەی؛ ئیتر تاقەت و توانای هەڵکردن نەبوون ‹دیگر آن خانه دل آنها را زده بود: ئیتر ئەو ماڵە دابووی لە دڵیان›.

**دل کسی را سوزاندن:** *[مجازی]* دڵی کەسێک ئێشاندن؛ دڵی کەسێک ڕەنجاندن؛ خەمبار کردنی کەسێک: **دل کسی را آزردن؛ دل کسی را به درد آوردن**

**دل کسی را شکستن:** *[مجازی]* دڵی کەسێک شکاندن؛ کەسێک ناهومێد و ناکام کردن ‹با حرف خود دل پیرزن را شکست: بە قسەکانی دڵی پیرەژنەکەی شکاند›.

**دل کسی را نرم کردن:** *[مجازی]* دڵی کەسێک نەرم‌کردنەوە؛ تووڕەیی و زویری کەسێک لابردن ‹با قصه گفتن دل او را نرم کرد: بە چیرۆک گێڕانەوە دڵی نەرم کردەوە›.

**دل کسی رفتن:** *[مجازی]* دڵی کەسێک لێ‌چوون؛ دڵوو یۆی وەنە چێویۆی شیەی؛ هۆگر و خوازیار بوون ‹هر روز دلش پی چیزی می‌رفت: هەر ڕۆژێک دڵی لە شتێک دەچوو›.

**دل کسی روشن بودن:** *[مجازی]* دڵی کەسێک ڕوون/ ڕۆشن بوون؛ بەرچاوی کەسێ ڕوون بوون؛ هیوادار بوونی کەسێک ‹دلم روشن است که کارت درست می‌شود: دڵم ڕوونە کە کارەکەت جێبەجێ دەبێ›.

**دل کسی ریختن:** *[مجازی]* دڵی کەسێک داکەوتن؛ دڵی کەسێک نەمان؛ دڵی کەسێ تەپین؛ لە نەکاو تووشی مەترسی و خلێلەی زەینی بوون: **دل کسی پایین/ فرو ریختن**

**دل کسی ریش شدن:** *[مجازی]* دلریش شدن

☜ **دلریش**

**دل کسی سوختن:** */مجازی/* دڵی کەسێک سووتان؛ تووشی ڕەنج و کەسەر بوون ‹دل زن از آن می‌سوخت که کاری نکرده بود: دڵی ژنەکە لەوە دەسووتا کارێکی نەکردبوو›.

**دل کسی شکستن:** */مجازی/* دڵی کەسێک شکان؛ بە هۆی نامرادی و ناهومێدییەوە تووشی کوڵ‌وکەسەر هاتن ‹با مرگ پسرش دل پیرزن شکست: بە مردنی کوڕەکەی دڵی پیرەژنەکە شکا›.

**دل کسی شور زدن:** */مجازی/* کەوتنە دڵەڕاوکەوە؛ کەوتنە دڵەخورپێوە؛ نیگەران بوون و تووشی خلێلە هاتن ‹از صبح دل من شور می‌زد: لە بەیانیەوە کەوتوومە دڵەڕاوکە›.

**دل کسی ضعف رفتن:** ١. دڵی کەسێک خاو بوونەوە؛ دڵی کەسێک بێ‌حاڵ بوون؛ تووشی سستی و بێ‌حاڵی هاتن ‹از گرسنگی دل او ضعف می‌رفت و نمی‌توانست بایستد: لە برسیەتیدا دڵی خاو ببووەوە و نەیدەتوانی خۆی ڕاگرێ› ٢. زۆر تامەزرۆ بوون ‹برای استراحتی کوتاه دلم ضعف می‌رفت: زۆر تامەزرۆی وچان‌دانێک بووم›.

**دل کسی غنج زدن:** */مجازی/* دڵی کەسێک کورکە کردن؛ زۆر بە ئارەزووی شتێکەوە بوون؛ یەکجار دڵ بە شتێکەوە بوون؛ زۆر خوازۆکی شتێک بوون: **دل کسی به قیلی‌ویلی افتادن**

**دل کسی فرو ریختن** ☜ **دل کسی ریختن**

**دل کسی کباب شدن:** */مجازی/* زگی کەسێک پێ‌سووتان؛ دڵی کەسێک بوونە بریان؛ دڵی کەسێ بوونە کەواو؛ زۆر خەفەتبار بوون ‹دل مردم برایم کباب شد: زگی خەڵکی پێم سووتا›.

**دل کسی گرفتن:** */مجازی/* دڵی کەسێک داگیران؛ دڵوو یۆی گیریایرە؛ خەفەتبار، دڵتەنگ یان شڵەژاو بوون ‹شب که می‌شد، از تاریکی، سکوت و تنهایی دلم می‌گرفت: شەو کە دادەهات، لە تاریکی، بێ‌دەنگی و تەنیایی دڵم دادەگیرا›.

**دل کسی هوای چیزی کردن:** */مجازی/* دڵی کەسێک بۆ شتێک شنیان؛ زۆر بە ئاوات و ئارەزووی شتێکەوە بوون.

**دل کندن:** */مجازی/* دەست لێ‌بەردان؛ دڵ لێ هەڵکەندن؛ دەست لێ‌هەڵگرتن؛ ددان چنە هۆرکەنتەی؛ پشت لێ‌کردن ‹به این آسانی نمی‌شود از آن دل کند: بەم هاسانیە ناکرێ دەستی لێ‌بەردەی›.

**دل نازک بودن** ☜ **دلنازک**

**دل نگران بودن:** دڵ نیگەران بوون؛ دڵ پەشێو بوون؛ بە دڵەخورپێ بوون.

**دل و رودهٔ چیزی را درآوردن:** */مجازی/* جەرگ و ڕیخۆڵەی شتێک دەرهێنان؛ شتێک تێکومەکان دان؛ ڕۆخڵەو چێوێوی بەرئاردەی؛ شتێک داژەنین؛ لەت‌وکوتی شتێک دەرهێنان؛ لە بەر یەک هەڵوەشاندنی کەل‌وپەلی شتێک ‹چرا دل و رودهٔ رادیو را درآوردی؟: بۆچی جەرگ و ریخۆڵەی رادیۆکەت دەرهێنا؟›.

**دلی از عزا درآوردن:** */مجازی/* سکێک سواخ دان؛ دڵ چەڕاندن؛ دەماخ تەخت‌کردن؛ بە حەزی دڵ گەیشتن ‹دیروز در سیمنار دلی از عزا درآوردیم: دوێنێ لە کۆبوونەوەکەدا سکیکمان سواخ‌دا›.

**از دل کسی خبر دادن:** */مجازی/* بە دڵی کەسێک کردن؛ لەتەک دڵ کەسێکا گەڕیان؛ بە خواست و ئاواتی کەسێک قسەکردن.

**از دل کسی خبر داشتن:** */مجازی/* بە دڵی کەسێک زانین؛ ئاگا لە دڵی کەسێک بوون؛ لە بیر و ڕا و ئەندێشەی کەسێک ئاگادار بوون.

**از دل کسی درآوردن:** */مجازی/* لە دڵی کەسێک دەرهێنان؛ زیزی کەسێک لابردن و ئاشت‌کردنەوەی ‹برادرت از دستم ناراحت شده بود،

رفتم از دلش دراوردم: براکەت لە دەستم زیز ببوو، چووم لە دلیم دەرهینا›.
**از دل کسی گذشتن**:*[مجازی]* دان لە دلی کەسێک؛ لە دلی کەسێک دان؛ بە دلّ کەسێدا هاتن؛ ئامای دلوو یۆیرە؛ تێفکرین بۆ ماوەیەکی کەم ‹از دلم گذشت کە امشب بروم سینما: دای لە دلم کە ئەوشەو برۆم بۆ سینەما›.
**از دل و دماغ افتادن**:*[مجازی]* لە پەل‌وپۆ کەوتن؛ دلّ/ مەیل ساردبوونەوە؛ بێ‌حالّ و حەوسەلە بوون.
**بد به دل راه ندادن** ☜ **به دل بد نیاوردن**
**به دل بد نیاوردن**:*[کنایی]* ڕەشبین نەبوون؛ خراپ بیر نەکردنەوە: **بد به دل راه ندادن**
**به دل کسی افتادن**:*[مجازی]* بە دلّی کەسێکدا هاتن؛ کەوتنە زەینی کەسێکەوە.
**به دل کسی برات شدن**:*[مجازی]* بە دلّ کەسێکدا هاتن؛ بە کەسێک سەرۆ بوون ‹بە دلم برات شده بود کە امروز می‌آیی: بە دلمدا هاتبوو ئەورۆ دیی›.
**به دل کسی چسبیدن**:*[مجازی]* بە دلّ کەسێکەوە نیشتن؛ دلّ کەسێ گرتن؛ بە کەیفی کەسێ بوون ‹حرفی زد کە خیلی بە دلم چسبید: قسەیەکی کرد تەواو بە دلمەوە نیشت›.
**به دل گرفتن**:*[مجازی]* گرتنە دلەوە؛ دلّمەند بوون؛ ڕەنجیان ☜ **دلگیر**
**به دل نشستن**:*[مجازی]* بە دلەوە نیشتن؛ زۆر خۆش و دلّنشین بوون.
**توی دل چیزی را خالی کردن** ☜ **تو**[۲]
**توی دل چیزی رفتن** ☜ **تو**[۲]
**در/ توی دل گفتن**:*[مجازی]* لە دلەوەگوتن؛ دلّەنە واتەی؛ لە دلا وتن؛ لەبەر خۆوە بیرکردنەوە.
**یک دل نه صد دل عاشق شدن** ☜ **یک**

**دل‌آزار** / delāzār/: *صفت.* دلازار؛ هۆی ڕەنجاوی و دلّئێشاوی.

**دل‌آزردگی** / delāzordegî ، ـها/: *اسم.* دلازاری؛ دلّمەندی؛ دلّئێشاوی؛ شەمزاوی؛ دلّجخاری؛ دۆخ یان چۆنیەتی دلازار بوون.

**دل‌آزرده** / delāzorde ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* دلّشکاو؛ دلّمەند؛ دلّمەن؛ دلّتەنگ؛ دلّپڕ؛ دلگران؛ دلڕەنجاو؛ دلّجخار؛ شەمزاو؛ ڕەنجاو؛ ڕەنجیاگ؛ دلّئێشاو.

**دل‌آسوده** / delāsûde/: *صفت.[ادبی]* دلّنیا؛ ئارخەیان؛ خاترجەم؛ خاجەم؛ خاوەن دلّدامەزراوی و دوور لە مەترسی و نیگەرانی ‹دل‌آسوده باش کە کارها بر وفق مراد است: دلّنیا بە کارەکان باش دەڕۆنە پێشەوە›.

**دل‌آسودگی** / delāsûdegî/: *اسم.[ادبی]* دلّنیایی؛ ئارخەیانی؛ خاترجەمی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خاترجەم بوون.

**دل‌آشوب** / delāšûb/ ☜ **پنجانگشت ـ۲**

**دل‌آگاه** / delāgāh ، ـان/: *صفت.[ادبی]* دلّئاگا؛ ئاوەزمەند؛ بیرەوەر؛ بیرمەند؛ ژیرەک؛ خاوەن ئاگایی و زانایی.

**دلار** / dolār ، ـها/: [انگلیسی]*اسم.* دولار؛ یەکەی پارەی ئامریکا، کانادا، ئوسترالیا و هەندێ ولاتی دیکە.

**دلارام** / delārām/: *صفت.[ادبی]* دلارام؛ دەلال: ۱. سوکنا؛ دلّتەنا؛ ئارامی دلّ ۲. بەردلّ؛ زۆر خۆشەویست.

**دل‌افروز** / delafrûz ، ـان/: *صفت.[مجازی، ادبی]* دلّگەشێن؛ دلخۆش‌کەر؛ دلّڕوون‌کەرەوە؛ دلارا؛ هۆی دلخۆشی.

**دل‌افگار** / delafgār ، ـان/: *صفت.[ادبی]* دلّپەشێو؛ دلّپەرێشان؛ دلّبرین؛ خەمبار؛ پەرێشان؛ دلّئەوگار: **دلفگار**

**دلاک** / dallāk ، ـها؛ ـان/: [عربی]*اسم.* ناتر؛ دەللاک؛ سەرشۆر؛ کاریگەرێک کە لە گەرماودا خەلّکی دەشوات.

**دلاکی** / dallākî ، ـها/: [عربی]*اسم.* ناتری؛

دەللاکی؛ پیشەی دەللاک.

**دلال** / dallāl ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. دەلاڵ؛ کزیر؛ نێواچی؛ کەسێ کە پیتەوای فرۆشیار بە کڕیار دەناسێنی و خۆشکەری کڕین و فرۆشتنە.

**دلال محبّت:** گەواد؛ قەواد؛ قەڵتە؛ قەڵتەبان؛ دەویت؛ دویت؛ ژنحیز؛ قورمساخ؛ ماسکەش؛ مەئەرس؛ کەسێ کە ژنی ناپاک بۆ پیاوانی ناپاک جۆر دەکا.

**دلال مَظلمه:** *[مجازی]* دەستە چیلە؛ کەسێ کە تووشی گونا و کاری خراپە دەبێت و دیتران کەڵکی لێوەردەگرن.

**دلالت** / delālat, dalālat ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. نیشانە؛ دۆخ یان چۆنیەتی دەلیل بوون ‹مشاهدەی دود دلالت دارد بر وجود آتش: دیتنی دووکەڵ نیشانەی بوونی ئاورە› ٢. ڕێنوێنی؛ ڕێشاندەری؛ ڕێنمایی؛ ڕانمایی؛ ئامۆژگاری؛ بەتایبەت لە بواری کرداری و ئاکاریەوە ‹می‌خواستم او را دلالت کنم: دەمەویست ڕێنوێنی بکەم› ٣. *[منطق]* ڕێتێبەری؛ هۆیەتی؛ شوێنهەڵگری؛ کار یان ڕەوتی پێزانینی شتێک بە هۆی بوونی شتێکی ترەوە ‹بە دلالت عقل: بە ڕێتیبەری ئاوەز› ٤. *[قدیمی]* ئاماژە؛ هێما.

**دلالت کردن:** ١. ڕێنوێنی کردن؛ ڕێنمایی کردن؛ ڕێ‌نیشاندان؛ ڕا نیشان دەی ٢. نیشانە بوون؛ دروشم بوون. هەروەها: **دلالت شدن**

**دلالی** / dallālî ، ـها/: [عربی]/اسم. دەلالی: ١. کاری دەلاڵ ‹مدتی دلالی آهن می‌کرد: ماوەیەک دەلالی ئاسنی دەکرد› ٢. حەقی دەلالی؛ پارەیەک کە بە بۆنەی کڕین یان فرۆشتنی پیتەواوە بە دەلاڵ دەدرێت ‹یک درصد هم دلالی گرفت: یەک لە سەدیش دەلالی وەرگرت›.

**دل‌انگیز** / delangîz/: صفت. دڵگەشێن؛ دڵبزوێن؛ دڵڕفێن؛ هۆی دڵخۆشی و شادی ‹رقص دل‌انگیز؛ هوای دل‌انگیز: هەڵپەڕکێی دڵبزوێن؛ هەوای دڵگەشێن›.

**دلاور** / delāvar ، ـها؛ ـان/: صفت. بوێر؛ دلاوەر؛ ئازا؛ دڵزەخم؛ دڵشێر؛ دڵستوور؛ دەڵ؛ ئەگیت؛ چاونەترس؛ چاونەترساو؛ نەترس؛ دلێر؛ بێباک؛ بەجەرگ؛ گەڕناس؛ زیخ؛ جامێر؛ موکور؛ چەلاق؛ بێتەرس؛ کەلەوا؛ کەلەبا؛ گرۆبەندە ‹زنی دلاور بود و همه از او حساب می‌بردند: ژنێکی بوێر بوو هەموو کۆیان لێ دەکردەوە›.

**دلاوری** / delāvarî ، ـها/: اسم. ئازایەتی؛ بوێری؛ دلاوەری؛ دڵشێری؛ دڵستووری؛ دۆخ یان چۆنیەتی ئازا بوون.

**دلاویز** / delāvîz/: صفت. *[ادبی]* دلگەشێن؛ بە کارتێکەریەکی خۆش بە سەر دڵ و دەروونەدا ‹بوی دلاویز: بۆی دلگەشێن›.

**دلایل** / dalāyel/: [عربی] جمعِ ☜ **دلیل**

**دلباختگی** / delbāxtegî ، ـها/: اسم. *[مجازی]* ئەویندارى؛ ئەڤینداری؛ ئەڤینی؛ دڵبەستەیی؛ دڵخوازی؛ عاشقی.

**دلباخته** / delbāxte ، ـها؛ ـگان/: صفت. *[مجازی]* ئەویندار؛ ئەڤیندار؛ دڵدار؛ دڵبەستە؛ دڵسۆتی؛ دڵداناو؛ عاشق.

**دلباز** / delbāz/: صفت. *[مجازی]* دڵباز؛ دلگوشا؛ ساباق؛ بە بەرژوەنی جوان یان بەرپانەوە کە هەستی مرۆ دەبزوێنێ. بەرانبەر: **دلتنگ؛ دلگیر** ‹اتاق دلباز؛ حیاط دلباز: هۆدەی دڵباز؛ حەوشەی دلگوشا›.

**دلبخواه** / delbexāh/: صفت. *[گفتاری]* دلیان؛ کەژ؛ دلها؛ دڵخواز؛ دلخاز؛ دڵخوا؛ هەڵبژێردراو بە پێی حەز و ویستی خۆی و بێسەرنج دان بە بنەما، قانوون یان دەستوورێک.

**دلبخواهی** / delbexāhî/: اسم. دلهایی؛ دڵخوازی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دلخواز بوون.

**دلبر** [1] / delbar ، ـها؛ ـان/: اسم. *[ادبی]* دڵبەر؛ دولبەر؛ دلوەر؛ کچ یان ژنێک کە دڵیان بۆ دەشنێت ‹دلبر جانان من، برده دل و جان من: دڵبەرە وەک گیانەکەم، بردی دڵ و گیانەکەم›.

**دلبر**[٢]: *صفت.* دڵبەر؛ دولبەر؛ دلدایی؛ دڵڕفێن؛ دڵفڕێن؛ گراوی؛ خاوەن جوانی و دڵڕاکێشی.

**دلبری** / delbarî ، ـها/: *اسم.* دڵبەری؛ دولبەری؛ دڵوەریا؛ کار یان ڕەوتی دڵ لێسانذن؛ دڵ بەرەو خۆ ڕاکێشان.

**دلبستگی** / delbastegî ، ـها/: *اسم.* گیرۆدەیی؛ گیرۆیی؛ دڵ گراوی؛ دڵبەستەیی؛ هەبوونی پێوەند و هۆگرەتی لە ناخی دڵەوە ‹هر انسان عاقلی به میهن خود دلبستگی دارد: هەموو مرۆڤێکی ژیر گیرۆدەیی بە وڵاتی خۆی هەیە›.

**دلبسته** / delbaste/: *صفت.* گیرۆدە؛ خاوەن پێوەند و هۆگرەتی لە دڵ و هەستدا لەمەڕ شت یان کەسێکەوە ‹آرام و سارا از سالها پیش دلبستەی یکدیگر بودند: ئارام و سارا چەنایچەن ساڵ گیرودەی یەک بوون›.

**دلبند** / delband ، ـان/: *[کنایی] صفت.* بەندڵ؛ بەردڵ؛ بەردڵان؛ بەندی دڵ؛ زۆر خۆشەویست ‹یار دلبند؛ فرزند دلبند: یاری بەندڵ؛ منداڵی بەردڵان›.

**دل به هم خوردگی** / delbehamxordegî/: *اسم.* دڵتێکچوویی؛ دۆخی ڕشانەوە؛ هێنانەوە؛ دۆخێک کە مرۆ هەست دەکا ناچارە بڕشێتەوە ‹بر اثر گرما دچار دل‌به‌هم خوردگی شده بودم: بە هۆی گەرماوە تووشی دڵ تێکچوویی ببووم›.

**دلپذیر** / delpazîr ، ـها/: *صفت. [مجازی]* دڵ پەسند؛ دلگر؛ تەرز؛ لەبەردڵان؛ جوان و لەبار ‹فضای دلپذیر؛ هوای دلپذیر: جێگای دلگر؛ هەوای دڵ پەسند›: **دلپسند**

**دلپسند** / delpasand/ ☜ **دلپذیر**

**دل‌پیچه** / delpîče/: *اسم.* باپێچ؛ دڵ پێچە؛ دڵ ئێشە؛ ژان و برک؛ گفێری؛ ئێشی ڕیخۆڵە کە لەگەڵ زگ‌چووندایە ‹یک ساعت بعد دچار دل‌پیچه شدم: پاش سەعاتێک تووشی دڵ پێچە بووم›.

**دلتا** / deltā/: [یونانی] *اسم.* دڵتا: ١. نێوی چوارەمین پیتی ئەلفوبێتکەی یوونانی ($\Delta,\delta$) ٢. *[ریاضی]* نیشانەی بگۆڕێک (وەک $\alpha$) ٣. *[ریاضی]* نیشانەی دیاریکراوی موعادلەی دەرجە دوو ٤. *ـها/[زمین‌شناسی]* ناڤروو؛ نێوان دوو ئاو؛ دەشتی ئاوماڵشتی وەک پەنجە کە لە ڕێژگەی ڕووباردا پێک‌دێ.

**دلتنگ** / deltang/: *صفت. [کنایی]* دڵتەنگ: ١. دڵپەڕۆش؛ خەمبار؛ دڵپڕ؛ دڵتژی؛ گرتە؛ قدیک؛ خەماوی؛ ڕەنجاو و خەمین لە کارەسات یان دۆخێک ‹پس از رفتنش خیلی دلتنگ شدم: دوای ڕۆیشتنی زۆر دڵتەنگ بووم› ٢. دڵخەف؛ تەنگ‌وتووش؛ تاریک و ناخۆش. بەرانبەر: **دلباز** ‹اتاق دلتنگ؛ خانەی دلتنگ: ژووری دڵتەنگ؛ ماڵی دلخەف›. هەروەها: **دلتنگ بودن؛ دلتنگ شدن**

**دلتنگی** / deltangî ، ـها/: *اسم. [کنایی]* دڵتەنگی؛ دڵپەڕۆشی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی دڵتەنگ بوون ٢. خەمباری؛ دلخۆری؛ دڵشکاوی؛ خەفەتباری و ڕەنجاوی بە بۆنەی ڕووداوێکی ناخۆشەوە.

▣ **دلتنگی کردن:** دڵتەنگی کردن؛ بێ تاقەتی کردن؛ ناڕەحەتی کردن؛ بە شێوەیەکی ئاشکرا تووشی خەفەت و خەم بوون، بەتایبەت دەربڕینی ئەو حاڵەتە ‹سارا برای مادرش دلتنگی می‌کرد: سارا بۆ دایکی دڵتەنگی دەکرد›.

**دلجویی** / delcûyî ، ـها/: *اسم. [مجازی]* دڵجۆیی؛ دڵنەوایی؛ دڵنەوازی؛ دڵداری‌دانەوە؛ کاری دڵخۆشی‌دانەوە؛ لاواندنەوە؛ ڤەژاندن؛ دڵدانەوە؛ ئاشت‌کردنەوە؛ میهرەوانی و تێکۆشان بۆ سڕینەوە و لابردنی پەژارە و ڕەنجاوی کەسێک ‹گاندی همواره از آسیب‌دیدگان دلجویی می‌کرد: گاندی هەمیشە لە لێقەوماوان دڵجۆیی دەکرد›. هەروەها: **دلجو**

**دلچرکین** / delčerkîn/: *[کنایی] صفت. [گفتاری]* دڵ کرمۆڵ؛ دڵ کرمن؛ دڵ کرمی؛ دڵگیر؛ دڵ ڕەنج؛ دلگران؛ دڵمەن؛ دڵ ئێشاو؛ دڵ مای؛ بەگلەیی؛ ڕەنجاو و زیز ‹پس از آن گفتگو از من دلچرکین است: دوای ئەو وتووێژە لێم دڵ کرمۆڵە›.

هەروەها: **دلچرکین بودن؛ دلچرکین شدن؛ دلچرکین کردن**

**دلچسب** / delčasb/: *صفت. [مجازی]* دڵگیر؛ دلگر؛ دڵ‌پەسند؛ لە بەردڵان؛ خاوەن دۆخی بە دڵەوە نیشتن ‹محیط دلچسب؛ قیافەی دلچسب: ئاقاری لە بەردڵان؛ سیمای دڵگیر›.

**دلخراش** / delxarāš/: *صفت. [مجازی]* دڵتەزێن؛ جەرگ‌بڕ؛ دڵچڕێن؛ هۆی ئازراوی و کەسەری زۆر ‹فاجعەی دلخراش؛ مرگ دلخراش: کارەساتی دڵتەزێن؛ مەرگی دڵچڕێن›.

**دلخسته** / delxaste/: *صفت. [کنایی]* دڵ‌ماندوو؛ دڵ‌برین؛ دڵ‌بەخەم؛ تووشی کەسەر و ماندوویەتی دەروونی ‹سرانجام بیمار و دلخسته به میهن بازگشت: دواخری نەخۆش و دڵ‌ماندوو گەڕایەوە بۆ ولات›.

**دلخواه** / delxāh/: *صفت.* دڵخوا؛ دڵخواز؛ دڵخاز؛ واستەن؛ واستەنە: ١. هاوگەر لەگەڵ خواستی دەروونی مرۆدا ‹این همان خانه دلخواه توست: ئەمە ئەو ماڵی دڵخوای تۆیە› ٢. هەڵبژێردراو بە حەزی خۆ نەک لە سەر ناچاریەوە ‹کار دلخواه؛ غذای دلخواه: کاری دڵخواز؛ چێشتی دڵخوا›.

**دلخور** / delxor/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* دڵخۆر؛ دلخورە؛ دلوەر: ١. دڵمەن؛ دڵگران؛ ڕەنجاو؛ ڕەنجیاو؛ ڕەنجیاگ ‹از حرفهای من دلخور نشو: لە قسەی من دڵمەن مەبە› ٢. پەرۆش؛ دڵتەنگ؛ دڵگیر؛ دڵتزی؛ خەماوی؛ نیگەران؛ دڵ‌پەرێشان؛ دڵ‌پەشێو؛ گرتە ‹نمی‌دانم چرا امروز خیلی دلخور بود: نازانم ئەوڕۆ بۆ وا پەرۆش بوو›.

**دلخوری** / delxorî ، ـها/: *اسم. [مجازی]* دڵخۆری؛ دلخوردی؛ دڵگرانی؛ دڵمەنی؛ لووتەلایی؛ لالووتی؛ نیگەرانی؛ دڵ‌پەرێشانی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دڵخۆر بوون ‹داداش، باختن که دلخوری ندارد: کاکە، دانان دڵخۆری پێ ناوێ›.

**دلخوش** / delxoš/: *صفت. [مجازی]* دڵخۆش؛ دلوەش؛ شاد؛ کەیف‌خۆش؛ ئۆنگە؛ کەیف‌ساز؛ گەش؛ دڵڕوون؛ دڵشاد؛ شادمان لە هەبوونی دۆخێک یان شتێک و ئۆگرەتی بەو شتە ‹من به تو دلخوش بودم، که تو هم داری می‌روی: من بە تۆ دڵخۆش بووم، ئەوا تۆیش خەریکی ئەڕۆی›.

**دلخوش‌کنک** / delxoškonak/: *اسم. [گفتاری]* دڵخۆشکەرە؛ شتێکی بێ‌بایەخ کە بێهۆ دەبێتە هۆی هیواداری و خۆشحاڵی ‹این حرفها فقط دلخوش‌کنک است و به حل مشکل کمکی نمی‌کند: ئەم قسانە هەر دلخوشکەرەیە و چارەسەری گرفتەکان ناکات›.

**دلخوشی** / delxošî ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* دڵخۆشی؛ دلخوەشی؛ دلوەشی؛ وەشەک: ١. خۆشحاڵی یان ئارامشتی زەینی ٢. ئەوەی کە دەبێتە هۆی وا خۆشیەک ‹تنها دلخوشی او پسرش بود: تەنیا دڵخۆشی ئەو کوڕەکەی بوو›.

▣ **دلخوشی دادن**: دڵخۆشی دانەوە؛ هیوادار کردن ‹هر روز به من دلخوشی می‌داد که بزودی آرام آزاد می‌شود: هەموو ڕۆژێ دڵخۆشی دەدامەوە کە ئارام بە زوویی ڕزگار دەبێت›.

**دلخون** / delxûn/: *صفت. [مجازی]* دڵخوێن؛ دلخوون؛ جگەرخوێن؛ تووش‌بووی کوڵ و کەسەری زۆر و ئازاردەر ‹سارا از دست شوهرش دلخون است: سارا لە دەستی شووەکەی دڵخوێنە›.

**دلدادگی** / deldādegî ، ـها/: *اسم. [مجازی، ادبی]* ئەوین؛ ئەڤین؛ هەڤین؛ عیشق؛ عەشق؛ خۆشەویستی زۆر.

**دلداده** / deldāde ، ـها؛ ـگان/: *اسم. [مجازی، ادبی]* ئەڤیندار؛ ئەویندار؛ هەڤیندار؛ بەندەوار؛ خاترخوا؛ عاشق؛ دڵداگ؛ کەسێ کە بە تەواوی عاشقە ‹دلدادەی بینوا: ئەوینداری کڵوڵ›.

**دلدار** / deldār ، ـان/: *اسم. [ادبی]* دلدار؛ دڵبەر؛ ئەوەی کە دڵ بۆی دەشنێ و وەبەر ئەوین دەکەوێ و ئەوینداری دەبن ‹افسوس که دل خون شد و دلدار نیامد: داخی داخانم دلم دەرهات و دلدارم

نەهات›.

**دلداری** / deldārî ، ـها/: اسم. دڵنەوایی؛ دڵدانەوە؛ هاودەردی دەگەڵ کەسێکدا کە تووشیاری پەژارەیە و تێکۆشان بۆ کەم کردنەوەی پەرۆشی و پەرێشانی. هەروەها: **دلداری دادن**

**دلدرد** / deldard/: اسم. ژان؛ دڵئێشە؛ دڵەدەرد؛ قلوومک؛ لەمدەژین؛ نەخۆشی و ئێشێ کە لە ناوزکدا پەیدا دەبێ ‹غذا از گلویش پایین نرفته بود کە دلدرد شدیدی گرفت: هێشتا چێشتەکە لە زاری نەچووبووە خوارەوە دڵئێشەیەکی خراپی پێدا پێچرا›.

**دلربا**[1] / delrobā/: اسم. دڵەڕبا؛ چەشنێ عاقێق بە ڕەنگی سەوز تا سووری مەیلەو قاوەیی کە بە بۆنەی دەنکگەڵی وردی میکاوە بریکەدارە و لە گەوهەرسازیدا بە کار دەڕوا.

**دلربا**[2] / ـیان/: صفت. [مجازی] دڵڕفێن؛ دڵفڕێن؛ دڵڕەڤێن؛ دڵبەر؛ دولبەر؛ زۆر جوان و دەلال کە هۆی هۆگرەتی و تامازرۆییە ‹او زنی دلربا بود: ژنێکی دڵرفێن بوو›.

**دلربایی** / delrobāyî ، ـها/: اسم. [مجازی] دڵڕفێنی؛ دڵفڕێنی؛ دڵبەری؛ دولبەری؛ کار یان ڕەوتی سەرنج ڕاکێشان و بەدیهێنانی حەز و تامەزرۆیی لە دیتراندا.

**دلرحم** / delrahm ، ـها/: [فارسی/ عربی] صفت. [گفتاری] دڵنەرم؛ دڵ بەڕەحم؛ دڵڕەحمین؛ خاوەن بەزەیی ‹خیلی دلرحم است و نمی‌تواند گریەی کسی را ببیند: زۆر دڵنەرمە و ناتوانێ گریانی کەس ببینێ›.

**دلریش** / delrîš/: صفت. [مجازی، ادبی] داخ لەدڵ؛ دڵجەخار؛ دڵبرین؛ دڵزام؛ دەروونزام؛ گەهراو؛ زۆر خەمین و خەمبار.

**دلزدگی** / delzadegî ، ـها/: اسم. [مجازی] بێزاری؛ وەڕەزی؛ وەڕسی؛ جاڕزی؛ فرۆز ‹تکرار و ابتذال موجب دلزدگی است: دووپاتەکردنەوە و چرووکی هۆی بێزاریە›.

**دلزده** / delzade/: صفت. [مجازی] وەڕەز؛ وەرس؛ جاڕز؛ کەیل؛ عێدر؛ بێمەعەد؛ وێڕس؛ کەرخ ‹می‌گفت از این طرز زندگی سخت دلزده‌ام: دەیگوت لەم چەشنە ژیانە تەواو وەڕەزم›.

**دلزندگی** / delzendegî/: اسم. [کنایی] دڵزیندوویی؛ دڵاوەدانی؛ دڵگەشی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شاد و سەرکەیف بوون.

**دلزنده** / delzende/: صفت. [کنایی] دڵ زیندوو؛ دڵزینگ؛ دڵزینی؛ دڵاوەدان؛ دڵگەش؛ خوازیاری شادی، پێکەنین و شۆخی و گەشبین و هیوادار بە ژیان ‹پیرمرد دلزنده‌ای بود: پیرەمەردێکی دڵزیندوو بوو›.

**دلسخت** / delsaxt/: صفت. [مجازی] دڵڕەق؛ دڵبەرد؛ دڵسەخت؛ بێبەزە؛ بێبەزەیی ‹ما تو را این‌قدر دلسخت نمی‌دانستیم: تۆمان ئەمەنە دڵڕەق نەدەناسی›: **سخت‌دل**

**دلسرد** / delsard/: صفت. [مجازی] دڵسارد؛ دلسار؛ دڵسەرد؛ ناهومێد؛ بێمەیل و هیوا یان بەبێ هۆگرەتی پێشوو ‹سارا با این حرفهایش مرا دلسرد کرد: سارا بەم قسانەی دڵساردی کردمەوە›.

**دلسردی** / delsardî/: اسم. [مجازی] دڵساردی؛ دڵساری؛ دڵسەردی؛ ناهومێدی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تەواسان و لە دەست دانی هۆگرەتی و هیوا ‹چرا می‌خواهی باعث دلسردی من بشوی؟: بۆچی دەتەوێ ببیتە هۆی دڵساردیم؟›.

**دلسوخته** / delsûxte/: صفت. [مجازی] جگەرسووتاو؛ جەرگسووتاو؛ زگسووتاو؛ دڵسزیای؛ دڵبرژاو؛ تووشیاری کەسەرێکی گەورە بە هۆی ناکامی یان لە دەست دانی شتێ یان کەسێکی زۆر خۆشەویستەوە (بەتایبەت منداڵ).

**دلسوز** / delsûz ، ـها؛ ـان/: صفت. [مجازی] دڵسۆز؛ خەمخۆر؛ هەڤسۆژ؛ جگەرسۆز؛ خاوەن هۆگرەتی هاوڕێ لەگەڵ هاودەردیدا ‹او برای ما

پدری مهربان و معلمی دلسوز است: بۆ مە باوکێکی دلۆڤان و مامۆستایەکی دڵسۆزە›.

**دلسوزی** / delsûzî ، ـها/: اسم. [مجازی] دڵسۆزی؛ هەڤسۆژی؛ خەمخۆری: ۱. سەرنج و چاودێری لەگەڵ هۆگرەتیدا ‹با علاقه و دلسوزی از بچەهایش نگهداری می‌کند: بە دڵسۆزی و خۆشەویستیەوە منداڵەکانی بەخێو دەکا› ۲. ئاکارێ کە نیشانەی نیگەرانی و پەژارەیی لەمەڕ دەرد و ڕەنجی کەسانی دیکەوەیە ‹دلسوزی تو برای این قاتل بی‌رحم عجیب است: دڵسۆزیت بۆ ئەم مرۆکوژە دڵڕەقە سەیرە›. هەروەها: **دلسوزی کردن**

**دل‌سیاه** / delsiyāh/: صفت. [مجازی] دڵڕەش؛ دلسیاو؛ دڵپیس؛ ڕقاوی و بەدگومان ‹این موجود دل‌سیاه و بی‌رحم به پیرزن و کودک هم رحم نکرده است: ئەم داعبا دڵڕەشە بێبەزەییە ڕەحمی بە پیرەژن و منداڵیش نەکردووە›.

**دلشاد** / delšād/: صفت. [مجازی] دڵگەش؛ دڵشاد؛ دڵخۆش؛ دڵشا؛ دڵشای؛ بەکەیف؛ دەماخچاخ؛ بەربەش لە شادی زۆر.

⊡ **دلشاد کردن**: دڵشادکردن؛ دڵخۆش کردن؛ دلاڤدان؛ دلاودان؛ مژدەی خۆش پێدان.

**دلشده** / delšode ، ـها؛ ـگان/: صفت. [مجازی، ادبی] دڵداناو؛ دڵنەماو؛ گیرۆدەی ئەوینی زۆر.

**دلشکستگی** / delšekastegî/: اسم. [مجازی] دڵشکاوی؛ زگسووتاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دڵتەنگ و خەمبار بوون بە هۆی ناهومێدی و ناکامیەوە ‹کارهایت مایەی دلشکستگی دوستانت شده است: کارەکانت بۆتە هۆی دلشکاوی هەوالانت›.

**دلشکسته** / delšekaste ، ـها؛ ـگان/: صفت. [مجازی] دڵشکاو؛ دڵشکیای؛ زگسووتاو؛ تووشیاری خەم و خەفەت و ناهومێدی بە هۆی نامرادی و ناکامیەوە: **شکسته‌دل**

**دلشوره** / delšûre ، ـها/: اسم. [مجازی، گفتاری] دڵەڕاوکێ؛ دڵخورتی؛ دڵخوردی؛ هەلەبەل؛ دڵەخورپێ؛ ڤا؛ ڕاچەنیوی؛ نیگەرانی ‹دیر کردی، همه به دلشوره افتادیم: زۆرت پێچوو، هەموو تووشی دلەڕاوکێ بووین›.

**دل‌ضعفه** / delza'fe/: [فارسی/ عربی] اسم. [گفتاری] دلخاوی؛ بووراوی؛ هەستی بێحاڵی و سەرگێژە (زۆرتر بە هۆی ماندوویی و برسیەتیەوە).

**دلفریب** / delfarîb/: صفت. [مجازی] دڵڕفێن؛ دڵفرێن؛ زۆر جوان و خوشیک بە جۆرێ کە سەرنجڕاکێش بێ ‹چهرەی دلفریب: چاری دلڕفین›.

**دلفگار** / delfegār/ ☜ **دل‌آفگار**

**دلفین** / delfîn/ ☜ **زبان‌درقفا**

**دلفین** / dolfîn/: [انگلیسی] اسم. دولفین: ۱. ـها/ گیانەوەری گوانداری ئاوژی بە درێژایی ۱٫۵ تا ٤٫٥ میترەوە کە زۆرتر بە کۆمەڵ لە زەریا و زەریاشارەکاندا دەژین و زوو کەوی دەبن: **خوک دریایی** ۲. وێنەیەکی ئاسمانی لە لەتەگۆی باکووریدا.

**دلق** / dalq/: اسم. [قدیمی] شڕەوپڕە؛ شڕەوشیتاڵ؛ ڕیپاڵ؛ گنجێکی هەژارانەی بە شڕە و پینە دووراو.

**دل‌قرصی** / delqorsî/: اسم. [مجازی، گفتاری] دڵنیایی؛ دلتەنایی؛ دڵقایمی؛ ئارخەیانی؛ خاترجەمی؛ بێخەمی؛ کار یان ڕەوتی دڵ ئاوخواردنەوە ‹چون از طرف تو دل‌قرصی نداشتم، نتوانستم جواب بدهم: چونکوو لە لایەن تۆوە دلنیاییم نەبوو، نەمتوانی وەلام بدەمەوە›. هەروەها: **دل قرصی دادن؛ دل قرصی داشتن؛ دل‌قرص**

**دلقک** / dalqak ، ـها؛ ـان/: اسم. ۱. کوستەبابی؛ گاڵتەچی؛ حەنەکچی؛ گەپچاڕ؛ گۆسارتمە؛ کەسێ کە بە کار و قسەی، دەبێتە هۆی پێکەنینی دیتران ۲. [مجازی] قەشمەر؛ لیبۆک؛ هێلۆل؛ کەسێ کە ئاکاری لە چاو خەڵکەوە بە گاڵتە و گەمە دێتە بەر چاو ۳. قردک؛ کۆسە؛ لیپۆک؛ هێلۆل؛ وشکەڕن؛ ئیشکەڕن؛

دەلی‌دومان؛ دەلوێ‌دومان؛ گاڵتەجاڕی گەمەی سیرک.

**دلقک‌بازی** / dalqakbāzî ، ـها/: اسم. ۱. [تعریض] شانۆی کومێدی ۲. گەپچاڕی؛ گاڵتەجاڕی؛ ئاکاری نەگونجاو و نەشیاو کە دەبێتە هۆی پێکەنینی خەڵکی.

**دلکش** / delkeš/: صفت. [مجازی، ادبی] دڵکێش؛ شەپاڵ؛ دڵکرِ؛ دڵبەر؛ فوودڵ؛ زۆر وەبەردڵان و سەرنجڕاکێش ‹آواز دلکش: ئاوازی دڵکێش›.

**دلکشی** / delkešî/: اسم. [مجازی] شەپالی؛ دڵکێشی؛ دڵکری؛ فوودڵی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرنجڕاکێش بوون.

**دلکو** / delko ، ـها/: [انگلیسی] اسم. [مکانیک] دلکۆ؛ ئامێری دابەشینی کارەبا بۆ تەقینەوە لە موتوردا.

**دل کور** / delkûr/ ☜ **کوردل**

**دلگداز** / delgodāz/: صفت. [مجازی] دڵتەزێن؛ جەرگ‌برِ؛ دڵسووتێن؛ دڵچرێن؛ زۆر خەفەت هێنەر کە مرۆ تووشی ڕەنجاوی دەکا ‹فاجعەی دلگداز: کارەساتی دڵتەزێن›.

**دلگرم** / delgarm/: صفت. [مجازی] دڵگەرم؛ چێ؛ دڵگەش؛ هیوادار و دڵ ئاسوودە ‹او با سخنانش ما را دلگرم کرد: بە قسەکانی دڵگەرمی کردین›.

**دلگرم کننده** / delgarmkonande/: صفت. [مجازی] دڵگەرمکەرەوە؛ دڵگەشێن؛ هۆی دڵگەرم بوون ‹سخنان دلگرم‌کننده: قسەگەلی دڵگەرمکەرەوە›.

**دلگرمی** / delgarmî/: اسم. [مجازی] دڵگەرمی؛ هۆگرەتی، هیوا و گوڕ و تین بۆ داهاتووی کار یان ڕووداوێ.

**دلگشا** / delgošā/: صفت. [مجازی] دڵگوشا؛ دڵباز؛ دڵواز؛ بەردڵ؛ دڵاوا؛ بە دۆخ، جێگا و چۆنیەتیەک کە هۆی دڵشاکەری و هێوری بێ. بەرانبەر: **دلگیر**

**دل گشاد** / delgošād/: صفت. [مجازی، گفتاری] لەش‌گران؛ لەش بە دۆشاو؛ ڕووسارد؛ بێ‌خەیاڵ؛ بێ‌مبالات؛ کەمتەرخەم و تەوەزەل.

**دل گنده** / delgonde/: صفت. [تعریض] گادڵ؛ کەردڵ؛ خوێنسارد و پشوودرێژ لەمەڕ ڕووداوانەوە ‹تو چقدر دل‌گنده‌ای، مگر نمی‌بینی از سر بچه خون می‌آید: چەندە گادڵی، مەگەر نابینی لە سەری منداڵەکەوە خوێن دێت؟›.

**دلگی** / dalegî ، ـها/: اسم. زگەڕۆیی؛ چڵێسی؛ زگدڕاوی؛ زکگووری؛ دەڵەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی زۆرخۆر بوون ‹این‌قدر دلگی نکن، زشت است: ئەوندە زگەڕویی مەکە، کەسنە›.

**دلگیر** / delgîr/: صفت. [گفتاری] ۱. دڵمەند؛ دڵگران؛ ڕەنجاو؛ گەهراو؛ ئازراو ‹به خاطر حرف آن روزم از من دلگیر شد: بە بۆنەی قسەکانی ئەو ڕۆژەمەوە لێم دڵمەند بوو› ۲. خەف؛ بە دۆخ یان چۆنیەتیەکی خەم و خەفەتهێنەریەوە. بەرانبەر: **دلباز؛ دلگشا** ‹اتاق دلگیر: ژووری خەف›.

**دلگیری** / delgîrî ، ـها/: اسم. ۱. دڵمەندی؛ دڵگرانی؛ ڕەنجیاگی ‹ترسیدم حرفهایم باعث دلگیری او بشود: ترسام قسەکانم ببێتە هۆی دڵمەندی ئەو› ۲. دۆخ یان چۆنیەتی خەف بوون.

**دلمردگی** / delmordegî/: اسم. [مجازی] دڵ‌مردوویی؛ دڵ‌مردەیی؛ دڵتەمری؛ دۆخ یان چۆنیەتی دڵ‌مردگ بوون ‹فقر، بیکاری و ناکامی باعث دلمردگی او شده بود: نەداری، بێکاری و نامرادی ببووە هۆی دڵ‌مردوویی ئەو›.

**دلمرده** / delmorde/: صفت. [مجازی] دڵ مردوو؛ دڵ‌مردە؛ دڵ‌مردی؛ دڵ‌مری؛ دڵ‌مردگ؛ مەلۆل؛ مەلوول؛ بەبێ دڵخۆشی، گەش‌بینی و هیوا بە ژیان ‹وقتی آزاد شد خیلی دلمرده بود: کاتێ بەر درا زۆر دڵ‌مردوو بوو›.

**دلمشغولی** / delmašqûlî ، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. [مجازی] دڵ پەرتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دڵ شەوشان؛ داگیرانی هزر و بیر بۆ چارەسەر

کـردنی گـیر و گرفـت، لـه بـەر نیگـەرانی لـە ڕووداوێک ‹وضع سارا باعث دلمشغولی خانواده‌اش شده بود: حاڵی سارا ببووه هۆی دڵ‌پەرتی بنەماڵەی›.

**دلمل** / dolmol/: *اسم.* فەریک؛ قـەرە؛ جەرمـە؛ زوردە؛ فەریکەی دەخڵ و دانەوێڵە.

**دلمه** / dalame/: *صفت.* دەڵەمە؛ دلمە؛ دۆڵـەمە؛ پلْپ ‹در چند جای دیوار خون دلمه بسته بود: لە چەنـد جێگای دیوارەکەوە، خوێن دەڵەمەی بەستبوو›.

◙ **دلمه بستن:** دەڵـەمە بەسـتن؛ پـلْپ بەسـتن؛ گرسان؛ گرسیان؛ ڕسـین؛ ڕسـیان؛ گرسـەی؛ گرسای؛ مـەیین؛ هێنـدێک خـۆگرتن و تونـد بوونەوەی تراو.

**دلمه** / dolme، ـها/: [ترکی]*اسم.* سارمە؛ دۆڵمە؛ قونتک؛ یاپراغ؛ یاپراخ؛ یاپراخی؛ ئـەپرەخ؛ پـراخ؛ ئاپراخ؛ چەن جۆر خۆراک کە پەسایان لە بـرنج، سەوزی و گۆشـتە و لـە نێـو گـەڵامێو، کەلـەم، باینجان، تەماتە، بیبار یان کوولەکـەی دەنـێن و دەیکولێنن. هەروەها: **دلمەی بادنجـان؛ دلمـەی برگ؛ دلمەی فلفل؛ دلمەی کلم**

**دلمیت** / dolomît/: [فرانسوی] ☜ **دُولُومیت**

**دلنـازک** / delnāzok، ـهـا/: *صـفت.[مجـازی]* دڵناسک؛ ناسکدڵ؛ کەمدڵ؛ کەم‌هەڵکرد لەمـەڕ دیتنی کوڵوکەسەر، ئازار یان سەختی بەتایبەت لە لایەن دیترانەوە ‹فکر نمی‌کردم این‌قدر دلنـازک باشـی: بـاوەڕم نـەدەکرد ئەونـدە دڵناسـک بی›. هەروەها: **دلنازک بودن**

**دلنشین** / delnešîn/: *صفت.[مجازی]* دڵنـشین؛ خـۆش؛ دڵـگر؛ دڵچەسپ؛ حـەیات؛ دڵـخواز و پەسندکراو، بەتایبەت لە بواری هەست و هزرەوە ‹موسیقی دلنشین؛ رفتار دلنشین: مووسیقای دڵنـشین؛ ئاکاری دڵگر›.

**دلنگـــران** / delnegarān/: *صـــفت.[گفتـــاری]* دڵـخورت؛ نیگـەران؛ دڵـنیگەران؛ دڵپەرێـشان؛ دڵەودوا ‹ما همه دلنگران بـودیم کـه مبادا بلایـی بـه سرت آمده باشد: هەموومان دڵخورت بووین نـەوەکوو تووشی بەڵایەک هاتبێتی›.

**دلنگرانـی** / delnegarānî/: *صـفت.* دڵـخورتی؛ نیگەرانی؛ دڵنیگەرانی؛ دڵ‌شەوشی زەینی ‹یـک زنگ بزن، مادرت را از دلنگرانی در بیـاور: تەلـەفوونێک بکە، دایکت لە نیگەرانی دەربێنە›.

**دل‌نمـــک** / delnamak/: *اســـم.* خواڵـــێن؛ بەردەخوێ؛ بەردەخوا؛ بـەردێک لـە خـوێ کـە بلۆرێکی ڕوون و سافە.

**دلنـواز** / delnavāz/: *صـفت.[مجـازی]* دڵـنەوا؛ دڵ‌لاوێن؛ دڵاوەر؛ دڵداریدەر؛ دڵخۆشیدەرەوە؛ هۆی دڵ دامەزران و خۆشی.

**دلنـــوازی** / delnavāzî/: *اســـم.* دڵـــنەوایی؛ دڵ‌لاوێنی؛ دڵجۆیی؛ دڵداری؛ دەلالەت؛ کار یان ڕەوتی دڵدانەوە؛ دڵخۆشی دانەوە.

**دلو** / dalv/: [عربی]*اسم.* ۱. هەلکە؛ دۆڵ؛ دەول؛ دۆڵـچە؛ ڕەنـدۆڵ؛ سـەتڵ؛ پـەقرەج؛ زرک؛ دەفرێکـی چـەرمی یـان کـانزایی زۆرتـر بـۆ هەڵـگۆزانی ئـاو لـە چـا ۲. *[نجـوم]* وێنەیـەکی گـەورەی ئاسمـانی لـە لەتـەگۆی باشـووریدا ۳. *[تقـویم]* یازدەهـەمین کـەلوو لـە بورجگـەلی دوانزەیینەی ساڵ، بەرانبەر بە ڕێبەندان.

◙ **دلو چرمی:** جەوەندە؛ جەوەنە؛ جەوەنگە.

**دلواپس** / delvāpas/: *صفت.[مجازی، گفتاری]* دڵەودوا؛ دڵەدوا؛ چـاوەدوا؛ چاوڵـەدوو؛ نیگـەران ‹دلواپس مباش، او که دیگر بچه نیست: دڵەودوا مەبـە، خۆ ئیتر منداڵ نیە›.

**دلواپـــسی** / delvāpasî، ـهـا/: *اسـم.[مجـازی، گفتـاری]* دڵـەودوایی؛ دڵـەدوایی؛ چـاوەدوایی؛ نیگەرانی و تـرس ‹با مـادرت حـرف بـزن و او را از دلواپسی در بیـاور: لەگـەڵ دایکتـدا قـسە بکـە و لـە دڵەودوایی دەریبێنە›.

**دلوار** / delvār/: *صفت.* دڵ‌ئاسـا؛ بـە بیچمێکـی وەکوو دڵ.

**دل‌وجان** / del-o-cān/ ☜ **جان‌ودل**

**دل وجرئت** / del-o-cor'at/: [فارسی/ عربی]*اسم.*

[گفتـــاری] دڵ و دەروون؛ جـــەرگ؛ دڵ؛ زراو؛ ئازایی؛ ئازایەتی؛ هـەناو؛ وره؛ زەهلـە؛ زەنـدەک؛ زەنـەق؛ زەنـدەق؛ بـوێری؛ هـەوێری؛ وێرایـی؛ کەلی؛ دلێری؛ نەترسی ‹من دل و جرئت این کـار را ندارم: من دڵ و دەروونـی ئەم کارەم نیە›

**دل‌ودمـــاغ** / del-o-damāq/: اسـم. [گفتـــاری] دەس و دڵ؛ واز؛ لەش؛ تاقـەت و تابـشت ‹دل و دماغ هیچ کاری را ندارم: دەس و دڵم بۆ هیچ کارێـک ناڕوا›.

▣ **از دل و دماغ افتادن**: [مجـازی] لـە پـەل‌وپـۆ کەوتن؛ تین نەمان؛ گوڕ نەمان؛ سارد بوونەوە؛ بێ‌تاقەت و دڵسارد بوونەوە ‹دیگر از دل و دمـاغ افتاده بود و کمتر از خانه بیـرون مـی‌رفـت: ئیتـر لـە پەل‌وپو کـەوتبوو، کـەم لـە مـاڵ دەردەکـەوت›.

هەروەها: **دل و دماغ داشتن؛ دل و دمـاغ پیـدا کردن**

**دل‌ورودە** / del-o-rûde/: اسم. [گفتاری] ناوسک؛ ناوزگ؛ جەرگ و ناو؛ جەرگ و ڕیخۆڵە؛ هەڤرگ؛ ڕۆخڵەی ئەندام یان پاژگەلی ناوەوەی هەر شتێ ‹آمدم دیدم دل و رودەی تلویزیون توی اتاق پهن است: هاتم دیتم ناوزگی تەلەڤیزیۆنەکە لە نێـو هۆدەکـەدا بلاوە›.

**دلـە**[1] / dale، ـهـا/: اسم. دەلـەک؛ گیانـەوەری گواندراری گۆشتخۆر بە کەولێکی نەرم و کولکنی خورمایی یان ڕەش و خۆڵەمێشیەوە، لـە ڕێـوی دەچێ و بە ئەندازەی پشیلەیەکە.

**دلـە**[2] / ـهـا/: صفت. نەوسـن؛ نەوسـێ؛ دەڵـە؛ چلێس؛ زگەڕۆ؛ زکەڕۆ؛ زکوونی؛ زگدڕاو؛ زکـین؛ زکن؛ سکن؛ زک لەوەڕین؛ زک‌کوور؛ زۆرخـۆری وا کە لە خـواردن ناوەسـتێتەوە (خـۆی نـاگرێ) ‹خیلی دله است، نمی‌تواند جلو شـکمش را بگیـرد: زۆر نەوسنە، ناتوانێ بەر سکی بگرێ›.

**دله** / dalle/: اسم. دەبوو؛ دەفری سـەر ئـاوەلای چوارپالـوو یـان گرۆڤـەری جـێ ئاجیـل یـان دانەوێلە لە برێ فرۆشگادا.

**دلەدزد** / daledozd، ـهـا؛ ـان/: صفت. [گفتاری] سـیرمەخۆر؛ کـەردز؛ هـووردز؛ لادز؛ شـڕەخۆر؛ دەڵەدز؛ خاوەن خۆ و هۆگرەتی بە دزینی شـتی بێ‌نرخ.

**دلـــەدزدی** / daledozdî، ـهـا/: اسـم. لادزی؛ دەڵـەدزی؛ سـیرمەخۆری؛ شـڕەخۆری؛ کـاری دزینی شتگەلی کەم بـایی ‹گـاهی از دخـل مغـازه دله‌دزدی می‌کرد: جار-جارە لە دەغلی دووکـان لادزی دەکرد›.

**دلهره** / delhore، ـها/: اسم. [گفتاری] دڵـخورتی؛ دڵـــشەوشی؛ چـــورچ؛ هۆفـــڕوونی؛ هەلەبـــەل؛ دڵـەخورپێ؛ دڵـەڕاوکێ؛ ڕاچـەنیوی؛ پەرۆشـی؛ پەشۆکاوی؛ پەشێوی؛ خرت‌وپرتی دڵ.

**دلهـــره‌آور** / delhoreāvar/: صـفت. [گفتـــاری] دڵشەوشـێن؛ هـۆی بـەدیهێنانی دڵـخورتی و پەشۆکان.

**دلیجـــان** / delîcān، ـهـا/: [از فرانـسوی] اسـم. [قدیمی] کالیـسکە؛ دلیجـان؛ فـایتوون؛ پـەیتون؛ دروشـــکە؛ کەرەســـەی ڕاگواســـتنەوە بـــە چوارچەرخـەوە کـە زۆرتـر بـە دوو یـان چـوار ئەسپەوە دەبەسرێ.

**دلـی ـــ دلـی** / deleydeley/: اسم. [تعـریض، گفتـاری] میزەمیـز؛ گیزەگیـز؛ ویرەویـر؛ سـۆزە؛ نارەنار؛ لۆرەلۆر؛ گۆرانی نەرم و لەبەرخۆ.

▣ **دلی-دلی کـردن**: میزەمیزکـردن؛ گیزەگیـز کـردن؛ ویرەویرکـردن؛ نێـورین؛ لۆرینـەوە؛ لۆرانـەوە؛ لـە بـەر خـۆوە نەرمەنـەرم گـۆرانی خوێندن.

**دلیر** / dalîr, delîr، ـها؛ ـان/: صفت. [ادبـی] دلێـر؛ دلیر؛ دڵ‌سـتوور؛ بەجـەرگ؛ بـە جـەرگ و دڵ؛ دڵ‌زەخم؛ ئـازا؛ بـوێر؛ عەگیـد؛ عـەگن؛ جـامێر؛ گەڕناس؛ مەرخوز؛ نـەوەرد؛ چاوتونـد؛ چاوقـایم؛ چاونەترس؛ چاونەترساو؛ بەجەرگ.

**دلیرانه**[1] / dalîrāne, delîrāne/: صفت. دلێرانـە؛ دلیرانـــە؛ ئازایانـــە؛ بوێرانـــە؛ بەهرەمەنـــد لـــە

پاڵەوانەتی و نەترسی ‹رفتار دلیرانه: ئاکاری دلێرانە›.

**دلیرانه**[۲]: *قید.* دلێرانە؛ دلیرانە؛ ئازایانە؛ بوێرانە؛ بەبێ ترس ‹در برابر دشمن دلیرانه پایداری کردند: لە هەمبەر دوژمنەوە دلێرانە بەرخودانیان کرد›.

**دلیری** / dalîrî, delîrî ، ـها/: /اسم. دلێری؛ ئازایەتی؛ دڵداری؛ چکی؛ بەجەرگی؛ بوێری؛ جامێری و ئازایی ‹دلیری به زور بازو نیست: دلێری بە هێزی قۆڵ و باسک نیە›.

**دلیل** / dalîl ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. /دلایل؛ أدلّه/ بەڵگە؛ پرنۆ؛ پاژ؛ پاژە؛ بەڵسا؛ مدوور؛ دەلیل؛ ئەوەی بۆ سەلماندنی دروستی خوازەیەک بە کار دەڕوا ‹به چه دلیل این حرف را می‌زنی؟: بە کام بەڵگەوە ئەم قسە دەکەی؟› ۲. /دلایل؛ أدلّه/ هۆ؛ سۆنگە؛ بۆنە؛ هەنگێزە ‹دلیل رفتن شما به سلیمانیه چیست؟: هۆی چوونتان بۆ سلێمانی چیە؟› ۳. نیشانە؛ نیشانی؛ شانەک؛ شانی؛ شانیک؛ هۆی زانین بە شتێ یان پەسندکردن و چەسپاندنی ‹برخاستن دود دلیل وجود آتش است: هەستانی دووکەڵ نیشانەی هەبوونی ئاورە› ٤. /ادبی/ ڕێنما؛ ڕێنوێن؛ ڕانما ٥. /بنایی/ پادیوار؛ ڕزنی هەوەڵی ئاجۆر یان کاشی کە ڕزنەکانی‌تر بە گوێرەی ئەو ڕێز دەکرێن.

▣ **دلیل آوردن**: بەڵگە هێنانەوە؛ گوتنی قسە یان نیشاندانی شتێ کە دروستی خوازەیەک دەسەلمێنێ ‹برای کار کردنش صد تا دلیل آورد: بۆ کارکردنی سەد بەڵگەی هێنایەوە›.

**دلیل بودن**: نیشانە بوون؛ بەڵگە بوون؛ دروست بوونی خوازە یان بۆچوونێک ‹همیشه دود دلیل آتش نیست: هەمیشە دووکەڵ نیشانەی ئاور نیە›.

**دلیل تراشیدن**: بڕ و بیانوو هێنانەوە؛ بەڵگە تاشین (زۆرتر ناڕاست) ‹می‌خواست برای غیبت برادرش دلیل بتراشد: دەیەویست بۆ نەبوونی براکەی بڕ و بیانوو بێنێتەوە›.

**دلیل خواستن**: بەڵگە ویستن؛ نیشانە گەرەک بوون؛ داوا کردنی شتێ لە خوازەر کە دروستی قسەکەی بسەلمێنێ.

**دلیل داشتن**: ۱. بەڵگە هەبوون؛ خاوەن نیشانە بوون ‹برای کارش دلیل داشت: بۆ کارەکەی بەڵگەی هەبوو› ۲. هۆ هەبوون؛ هاندەر یان سۆنگەدار بوون ‹خرابی دیوار دلیل داشت و آن هم فشار آب بود: خراپی دیوارەکە هۆی هەبوو، ئەویش گوشاری ئاو بوو›.

**دم** / dam ، ـها/: /اسم. ۱. هەناسە؛ بێهن؛ بینک؛ بین؛ پەتۆ؛ کار یان ڕەوتی هەڵکێشان یان هەڵمژانی هەوا بۆ ناو سی یان سیئاو ‹دم زدن: هەناسە دان› ۲. هەناسە؛ پەتۆ؛ ئاهـ؛ هەڵم؛ هەوایەک کە لە سنگەوە دەدرێتە دەرەوە ‹دم گرم: هەناسەی گەرم› ۳. سات؛ هەل؛ هەلە؛ تاو؛ تان؛ دەم؛ کات؛ قاس؛ هەناسە؛ نەفەس؛ گاف؛ گام؛ عان؛ ئان؛ کاتێکی زۆر کورت بە ئەندازەی هەناسە دانێک ‹یک دم آرام نمی‌گرفت: ساتێک نەدەسرەوا› ٤. دەم؛ دەمە؛ مووشەدەمە؛ پفەک؛ نەپاخ؛ جۆرێک ترومپای با بە شێوەی کیسەیەکی چەرمی گەورە و دەسکدار کە لە کارگەگەلی دەستیدا بۆ گەشانەوە و هەڵگیرساندنی ئاور بە کار دەڕوا ‹دم را دمید تا آتش سرخ شد: دەماندیە دەمەکەوە تا ئاورەکە گەشایەوە› ٥. دەم؛ دەمە؛ دەڤەر؛ لێوار؛ لێو؛ لێوارە؛ زێوار ‹دم تیغ: دەمی تیغ› ٦. /گفتاری/ هەڵم؛ هەڵمی؛ هەوە؛ هەپ؛ هالاو؛ کەلدومان؛ بۆق ‹هوا دم دارد: هەوا هەڵمی هەیە› ۷. بەر؛ وەر؛ کەراخ ‹دم در بد است، بفرمایید داخل: بەر دەرگا عەیبە، فەرموونە ژوورەوە›.

▣ **دم آخر**: ۱. ئاخر کات؛ دوایین کات؛ ئاخر سەر؛ دوا کات ‹دم آخر پشیمان شد: ئاخر کات پەشیمان بووە› ۲. ئاویلکە؛ ئاوزینگ؛ ئاوەزینگ؛ گیانەلا؛ گیانەلاو؛ گیانەلاو؛ دوا هەناسە؛ دوا دەم؛ جووکەنە؛ دما هەناسە؛

سەرەمەرگ؛ کاتی مردن؛ دوا کاتی ژیان.

**دم بە ساعت:** پەیتاـپەیتا؛ پەستاـپەستا؛ پەساـپەسا؛ هەیتاـهەیتا؛ لە پەستا؛ دەمایدەم؛ تاونەتاو؛ دەماودەم؛ لە ماوەگەلی کورت و دوابەدوای یەکدا.

**دم سرد:** */مجازی/* ١. ئاهی سارد؛ هەناسەی سارد؛ ئاهـ ٢. قسەی ناهمیٚ کەر؛ قسەی دڵساردکەر.

**دم گرم:** */مجازی/* هەناسەی گەرم: ١. قسەی شادیهێن و هیوابەخش ٢. قسەی بە تین و گوڕ.

**دم واپسین:** ئاویلکە؛ گیانەلا؛ گیانەلاو؛ گیانەلاو؛ ئاوزینگ؛ ئاوەزینگ؛ هەوزینگ؛ نوقتکا پەیەن؛ دوا هەناسە؛ دما هەناسە؛ دوا دەم: ١. دوا نەفەسی پێش مەرگ ٢. جووکەنە؛ سەرەمەرگ؛ کاتی مەرگ؛ دەموو مەرگی.

▣ **دم برنیاوردن:** */مجازی/* دەم لێکنان؛ نق نەکردن؛ فزە لێوە نەهاتن؛ کڕ و کپ بوون؛ بیٚ دەنگ بوون؛ دەمگرتن؛ هیچ نەگوتن؛ دەنگ نەکەردەی؛ وزە نەکەردەی: **دم درکشیدن**

**دم درکشیدن** ☜ **دم برنیاوردن**

**دم زدن:** ١. هەناسە دان؛ هەناسەکێشان ٢. */مجازی/* ناو بردن؛ دەم هاویشتن؛ ددانەدن؛ دەڤ ئاویتن؛ هەڵشلنگاندن؛ هەڵشلینگاندن؛ شاتوشووت کردن؛ لافوگەزافکردن ‹او همیشه از دوستی دم می‌زد، ولی برای کسی کاری نمی‌کرد: هەمیشە لە دۆستایەتی ناوی دەبرد، کەچی بۆ کەسیش کارێکی نەدەکرد›.

**دم کردن:** ١. دەمکردن؛ لێنان؛ چیٚ کرنی شتیٚ بە هەڵم ‹دم کردن چای: دەمکردنی چایی› ٢. هەڵمکردن؛ بۆق کردن؛ بەدیهاتنی هەوای گەرم و شۆدار.

**دم کسی را دیدن:** */گفتاری/* کولاندنی کەسێک؛ کەسێک سازکردن؛ کەسێک (بە پوول یان بە تەما خستن) بۆ کارێک تەیار کردن.

**دم کشیدن:** دەمکێشان؛ ئامادە و بەرهەڤ بوونی ئەوەی کە لێنراوە.

**دم گرفتن:** بە کۆ چڕین؛ کۆمبێژکردن؛ پێکەوە خوێندن؛ پێوەرە واتەی؛ دەم گرتەی؛ گەرەلاوژە/ گەرەلاوزیٚ/ گەرەلاویژیٚ کردن؛ بە گەل خوێندن؛ ئاوازیٚ بە کۆمەڵ خوێندن، بەتایبەت چامەیەک چەندپاتە کردنەوە.

**دم** /dame/: *حرف.* بەر: ١. لای؛ کن؛ لە بەر؛ وەروو؛ لاو؛ دەف؛ ل جەم؛ نک؛ زۆر نێزیک بە شتێکەوە ‹دم دست: بەر دەست› ٢. ژێر ‹خانە را گرفت دم جارو: ماڵەکەی دایە بەر گەسک› ٣. بەرە؛ سەرە؛ کات؛ گاڤ؛ گاو؛ گاپس؛ دەم؛ قاس؛ لە وەختی ‹دم صبح؛ دم مرگ: بەرەبەیان؛ سەرەمەرگ›.

▣ **دم بخت:** عازەو؛ پێگەییو؛ وەختەشوو؛ بەربەخت؛ پێگەیشتوو؛ کلیل بە بەرۆک ‹دختر دم بخت: کەنیشکە عازەو›.

**دم دست:** بەر دەست؛ بەر دەس؛ وەر دەس: ١. لە بەر دەست ٢. لە ژێر دەست ‹دم دست پدرش کار می‌کند: لە بەر دەستی بابی کار دەکات›.

**دم دستی** ☜ **دمدستی**

**دم صبح:** بەرەبەیان؛ بەربەیان؛ دەم دەما؛ دەم دەمان؛ کازیوە؛ کازێوە؛ بوولێڵ؛ بوومەلێڵ؛ بوولێڵە؛ شەوەکی زوو؛ گەڤل؛ کاتی بەیانی.

**دم مرگ:** ئاویلکە؛ ئاوزینگ؛ ئاوەزینگ؛ هەوزینگ؛ گیانەلا؛ گیانەلاو؛ گیانەلاو؛ سەرەمەرگ؛ دوا هەناسە؛ نوقتکا پەیەن؛ دەمی مەرگ.

**از دم:** */گفتاری/* هەموو؛ تێکرا؛ وێکڕا؛ لەبەر یەک؛ سەر و بەر؛ گشت؛ گرد؛ بە گەل؛ تەواو؛ تواو؛ تەمام.

**دم / dom** ، ـها/: *اسم.* كلـك؛ دوو؛ دم؛ دويـڤ؛ ديڤ؛ دوڤك؛ دوڤ؛ دووڤ؛ دووچكه؛ جووچكـه؛ قنيچكه؛ قليچكه؛ كوری؛ قاچک؛ قاچ: ۱. بەشی (زۆرتــر) بــاریکی دوای لەشــی زۆرێــک لــه مۆرغەداران کـه بریتیـه لـه ئاخرین مۆغـەرەی پشتیان ‹دم گـاو؛ دم گربـه: كلكـی گـا؛ جووچكـەی پشیله› ۲. بەشی دواییینی لەشی پەلەوەر لەگەڵ پەڕەکانیــدا ‹دم خـروس: جووچكـەی كەڵەشـێر› ۳. بەشی دوایـینی لەشـی خزۆکـان کـه زۆرتـر باریکه ‹دم مار؛ كلكی مار› ٤. پەلی دواینی ماسی یان گوانداراني ئاوژی ٥. بەشی دوایینی فڕۆکـه، هیلیکوپتیر یـان مووشـەک ‹دم هواپیمـا؛ كلكـی فڕۆكه› ٦. *[گیاەشناسی]* بەندیکـه؛ بەنیکەیـەکی باریـک کـه میوه بـه شاخه یـان هێشووەوه دەلکێنێت ۷. *[مجازی]* دوا؛ دمـا؛ كلكـه؛ شـوێن؛ درێژه.

▣ **دم خــــروس:** *[مجــازی]* كلكــی كەڵــەباب؛ جووچكــەی كەڵەشـێر؛ بەڵـگەی ناڕاسـتی و درۆزنی.

**دم گــرگ:** *[مجـازی، قـدیمی]* سـەو گـورگ؛ سەوگر؛ سەوگور؛ ڕووناکی خۆرهەڵات لە كـاز و كووزی بەیانیدا.

▣ **دم بـه تلـه نـدادن:** *[مجـازی]* دوو بـه تەڵــەوه نەدان؛ خۆ لە ئاوی خوڕ نـەدان؛ عـن نـەدەی تەڵەوه؛ خۆ تووش نەکردن ‹خواستم بـرای آزاد زن بگیرم دم به تله نداد: ویستم بـۆ ئـازاد ژن بێـنم دووی به تەڵەوه نەدا›.

**دم جنباندن:** *[تعریض]* كلک بـادان؛ كلكەلـەقێ کردن؛ كلكەسووتێ/ سـووتەکردن؛ كلكـەفلێ کردن؛ كلكەسـووتەکێ‌کـردن؛ جووچكەلـەقێ کردن؛ ماستاوکردن؛ ماستاو ساردکردن؛ دەڤ هلـوکردن؛ دالانی مـالایره؛ پیازپـاککـردن؛ زمــانلووســیکـردن؛ خولــتەکردن؛ پێــدا هەڵگوتن ‹این روزها خیلی برایت دم میجنباند: ئەم ڕۆژانە زۆر كلكت بۆ با دەدا›.

**دم خود را تو کشیدن:** *[تعریض]* كلكـی خـۆ دە گەڵۆزگرتن؛ قنگ بە سەر شوالـی خـۆدا دان؛ بە هۆی تـرس، ناکـامی یـان نەگەیـشتن بـه ئامانج، کزکردن.

**دم درآوردن:** *[تعریض]* قولاب دەردان؛ قـولاپ دەرهاوردن؛ چغه دەرکـردن؛ دەمگـرتن؛ دوو دەراوردن؛ هێز یان بوێری پەیدا کـردن ‹حـالا دیگر او هـم دم دراورده و بـه مـن جـواب مـیدهـد!: ئێسته ئـەویش قـولابی دەرداوه و جواوەجـووییم دەکا!›.

**دم را روی کول گذاشتن:** *[تعریض]* كلک دانـه سەر شان؛ دوچكه به كۆڵا دان؛ جووچكه دانه ناو گەڵ؛ باریکەوه بوون؛ دووی بۆره گرێـدان؛ ناهومێـد و ناکـام بـوون (لـەگـەڵ ڕۆیـشتن دەکەوێ) ‹دمش را گذاشـت روی کـولش و از آنجـا رفت: كلكی دایه سەر شانی و لەوێ ڕۆیشت›.

**دم سیخ شدن:** *[مجازی]* دەم داچەقانـدن؛ دەم داچەقانن؛ لە نێو چوون؛ سلسار بوونەوه؛ قولێ جووت بیەی؛ کلاش جفت بوون؛ مردن.

**دم شـتر بـه زمـین رسـیدن:** *[کنـایی]* ڕیـش گەیشتنه بەر پـێ؛ پێویـست بـه کـاتێکی زۆر بوون ‹تا آن وقت دم شتر به زمین میرسـد: تـا ئـەو کاته ریشم دەگاته بەر پێ›.

**دم کـسی را تـوی بـشقاب گذاشـتن:** *[تعـریض]* شووتی دانه ژێر باڵ کەسێک؛ با کردنـه قـول کەسێک؛ با کردنه کەسێکدا؛ پووش/ پـشکەڵ نانه ژێـر پـای کەسـێکەوه؛ لـه ڕواڵـەتەوه بـه کەسێکدا هەڵگوتن و ڕێز لێنانی.

**دم کـسی گیـر بـودن:** *[مجـازی]* جووچكـەی کەسێک لە بەر دەرگـادا بـوون؛ پـای کەسـێ گیر بوون؛ تووش بوون؛ گرفتار بوون ‹تا وقتـی دمش گیر بود، صدایش در نمیآمد: تا جووچكەی لە بەر دەرگادا بوو، دەنگی دەر نەدەهات›.

**دم گاوی به دست آوردن:** *[کنایی]* دەسـت لـه شوێنێک بەن بـوون؛ دەس بـه ئـاو و نانێـک

گەیشتن؛ هۆی بژیوی ژیان دۆزینەوە.
**دمی به خمره زدن**: *[مجازی]* لێویک تەڕکردن؛ چۆڕێک شەراو خواردنەوە ‹آن شب دمی به خمره زده بودند و می‌ترسیدند گیر بیفتند: ئەو شەوە لێویکیان تەڕکردبوو دەترسان گیر کەون›.
**با دم خود گردو شکستن**: *[مجازی]* بە تڕ گوێزەڵە/ گوێز شکاندن؛ بزەی سمێڵ هاتن؛ بە کلک بەردەئاش سووڕاندن؛ زۆر شاد و بەکەیف بوون ‹وقتی خبر را شنید با دمش گردو می‌شکست: کاتێ خەبەرەکەی بیست بە تڕ گوزەڵەی دەشکاند›.
**با دم شیر بازی کردن**: *[کنایی]* بە ئاور کایە کردن؛ یاری بە ئاگرکردن؛ کاری پڕمەترسی کردن.
**به دم کسی بستن**: *[تعریض]* بە کەسێکەوە هەڵواسین/ چەسپاندن ‹کلی لقب و عنوان دهن‌پرکن به دم او بستند: زۆرێک نازناو و سەرناوی زلە‌زلەیان پێوە هەڵواسی›.
**دما** / damā ، ـها/: *اسم*. ١. دەما؛ پلەی ساردی و گەرمی بە پێی پێومانێکی دیاریکراو (وەک دەرەجەی سیلیسیووس یان فارنهایت) ٢. تین؛ تینی؛ تن؛ تاو؛ تاوە؛ گەرما؛ گڕە.
▣ **دمای اشتعال**: دەمایێ کە شتیک بەخۆیەوە تێدا داگرسێ؛ گەرمایەک کە بتوانێ شتێک بەبێ ئاور پێوەنان هەڵایسێنێ.
**دمای صفر مطلق**: سیفری ڕەها؛ دەمای ١٦،٢٧٣- سانتیگراد/ سلسیوس کە وایدەگرن مولوکوولەکانی تێدا دەسرەون و ماک، وزەی گەرمایی و جووڵەی نامێنێ.
**دماپای** / damāpāy/ ☜ **تِرمُوستات**
**دماجفت** / damācoft/: *اسم*. ئامێرێ بۆ پێوانی تین لە دەزگایێکدا؛ تێرمۆکوپل.
**دمادم** / damādam/ ☜ **دمبدم**
**دمار** / damār/: [ترکی/ ؟]*اسم*. دەمار؛ ڕەگ و پەی؛ ڕەگ و ڕیشە.

▣ **دمار از روزگار کسی درآوردن**: *[کنایی]* ڕیشەی کەسێ دەرهێنان؛ دەمار لە کەسێ دەرهاوردن؛ ئاو چاو کەسێ سەندن؛ بە سەختی کەسێک ئەشکەنجە و ئازار دان.
**دم‌اسب** / dom(e)'asb ، ـها/: *اسم*. کلکە ئەسپ؛ فلچەی بۆتڵ؛ گیایەکی دەشتەکی ناوچەگەلی شێدار، بە دەنکی بچووک و قاوەییەوە، کە بۆ دروستکردنی تەزبیح و ڕەنگی موو کەڵکی لێ وەردەگرن.
**دم‌اسبی** / dom(e)'asbî/: *صفت*. دوو ئەسپی؛ داموسی؛ وەکوو کلکی ئەسپ.
**دماسپهر** / damāsepehr/ ☜ **گَرمکُره**
**دماسنج** / damāsanc ، ـها/: *اسم*. دەماپێو؛ گەرماپێو؛ هەر کام لە ئامرازگەلی جۆراوجۆر بۆ ئەندازەگرتنی دەما، بەتایبەت لوولەیەکی ناسکی شیشەیی کە سەرێکی بەسراوە و ئەو سەرەکەی بە گلۆپێ لە تراو (زۆرتر جیوە و ئەلکول) دەگا کە بە هەڵکشانی پلەی گەرما هەڵدەچێ و لە ساردەوە بووندا دادەکشێ.
▣ **دماسنج پزشکی**: دەماپێوی بژیشکی؛ گەرماپێوی پزشکی؛ چەشنێک دەماپێو کە بە ٣٥ تا ٤٢ دەرەجەی سەد بەشی دابەش کراوە و بۆ پێوانی پلەی گەرمای لەش بە کار دەڕوا.
**دماشیب** / damāšîb/: *اسم*. توێژاڵێ لە تراودا کە دەمای بان و خواری جیاوازە.
**دماغ** / damāq/: *اسم*. ١. *ـها/ [گفتاری]* لووت؛ لووتە؛ بێقل؛ نوفت؛ دفن؛ تفنک؛ کەپک؛ زنجی؛ کەپۆ؛ کەپ ‹از دماغ او خون زیادی می‌رفت: خوێنێکی زۆر لە لووتی دەهات› ٢. *[مجازی]* کەیف؛ دەماخ؛ حاڵ ‹دماغ چاق بودن: کەیف ساز بوون› ٣. *[گفتاری]* کەپک؛ لووت ‹دماغ کشتی؛ دماغ هواپیما: لووتی فڕۆکە؛ کەپکی کەشتی›.
▣ **دماغ خود را بالا کشیدن**: چڵمی خۆ هەڵلووشان؛ لووت خۆ هەڵخستن؛ چڵموو وێ هۆرلووشتەی.

**دماغ کسی باد داشتن:**[کنایی] بە دەعیە و دەمار بوون ☜ باد دماغ، **باد**[1]

**دماغ کسی چاق بودن:**[مجازی، گفتاری] کەیفی کەسێک خۆش/ ساز/ کۆک بوون؛ دەماخ بیەو یۆی؛ بە دەماخ بوون؛ خۆشحاڵ و سەرزیندوو بوونی کەسێک ‹دماغت چاق است؟: کەیفت خۆشە؟›.

**دماغ کسی را به خاک مالیدن:**[کنایی] دەمی کەسێک شکاندن؛ کەسێک بەزاندن و سووک کردن ‹دماغ دشمن را به خاک مالیدیم: دەمی دوژمنمان شکاند›.

**دماغ کسی را سوزاندن:**[کنایی] دەم لە پووش کردنی کەسێک؛ کەسێک خیت‌کردن؛ ناهمێ کردنی کەسێک ‹حسابی دماغ او را سوزاند: چاک‌ـچاک دەم لە پووشی‌کرد›.

**دماغ کسی سوختن:**[کنایی] دەم لە پووش بوونی کەسێک؛ خیت بوونی کەسێک؛ ناهمێ بوونی کەسێک ‹دماغش سوخت و دست خالی برگشت: خیت بوو، خاڵی گەڕاوە›.

**دماغ گرفتن:** ۱. لووت‌گیران؛ کپ بوونی لووت ۲. لووت سڕین؛ لووش‌کردن؛ لووشاندن؛ لووش کەردەی؛ شم‌کردن؛ هنگ‌کردن.

**از دماغ فیل افتادن:**[مجازی] لووت‌بەرز بوون؛ لە لووت فیلەوە داکەفتن؛ دەمار بەرز بوون؛ بادی هەوا بوون.

**از دماغ کسی افتادن:**[مجازی] بە دەم دانیان؛ لە دەم شتێکەوە داکەوتن؛ وەکوو شتێک بوون؛ لە شتێک چوون ‹انگار از دماغ دایش افتاده!: هەر ئێژی خاڵی بە دەم داینەوە!›.

**از دماغ کسی بیرون آمدن:**[مجازی] لە لووت کەسێ هاتنەوە؛ لە قوڕگ کەسێک هاتنەوە؛ تێکچوونی کەیف و خۆشی پێشوو ‹آن روز هرچه تفریح کرده بودیم از دماغمان بیرون آمد: ئەو ڕۆژە هەرچی ڕامانبوارد لە لووتمان هاتەوە›.

**درکاری دماغ سوزاندن:**[کنایی] ☜ در[2]

**سر دماغ بودن** ☜ **سردماغ**

**موی دماغ شدن:**[مجازی] ☜ موی دماغ، **مو**

**دماغ** / demāq/: [عربی]اسم.[ادبی] مێشک؛ مەژگ؛ مەژی؛ مژی.

**دماغ‌پرور** / demāqparvar/: [عربی/ فارسی] صفت.[مجازی، ادبی] بۆنخۆش؛ خۆشبۆ؛ وەشبۆ.

**دماغ‌سوختگی** / damāqsûxtegî/: اسم.[گفتاری] دەم‌لەپووشی؛ خیتی؛ ناکامی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرنەکەوتن ‹جواب سارا باعث دماغ‌سوختگی او شد: وەلامی سارا بووە هۆی دەم لە پووش بوونی›.

**دماغ‌سوخته** / damāqsûxte، ـها/: صفت.[گفتاری] خیت؛ دەم لە پووش؛ ناکام ‹آن روز نیامدی، حسابی دماغ‌سوخته شدیم: ئەو ڕۆژە نەهاتی، تەواو خیت بووین›.

**دماغ‌کوفته‌ای** / damāqkûfte'î/: صفت.[گفتاری] لووت‌گونکەیی؛ گونکەلووت؛ خاوەن لووتی پان و پۆڕ.

**دماغه** / damāqe، ـها/: اسم. دەماغە: ۱. کەپک؛ پێشکۆ؛ باریکە بەژێ کە لە ئاودا چووەتە پێشەوە ۲. کەپک؛ لووت؛ بەشی بەرووی ماشێن، فڕۆکە یان کەشتی کە بەرەوپێش هاتووە ۳. لووتکە؛ لوتکە؛ لووتە؛ کەلپە؛ کێلبە؛ کەلپەشاخ؛ دەرپەڕیوی لە کێو و شاخدا.

**دماغی** / demāqî/: [عربی] صفت. مێشکی؛ مەژگی؛ پێوەندیدار یان سەر بە مەژگەوە ‹قوای دماغی: هێزگەلی میشکی›.

**دماکره** / damākore/ ☜ **گرمکره**

**دمان** / damān/: صفت.[ادبی] بەدەمان؛ بەدەم؛ خاوەن لێهاتوویی و توانایی دەماندن (وەکوو دەردانی هەوای زۆر لە ڕێگەی دەم یان لووتەوە) ‹اژدهای دمان: هەژدیهای بەدەمان›.

**دمانگار** / damānegār، ـها/: اسم. دەمانووس؛ ئامێری ئەندازەگیری و نووسینی دەما.

**دمب** / domb، ـها/: اسم.[گفتاری] کلک؛ دوو؛

دویڤ؛ دووچکە؛ جووچکە؛ قلیچکە.

**دمباریک** / dambārîk ، ـها/: اسم. ۱. دەمباریک؛ چەشنێ ئەمۆردەستی کە نووکەکەی باریک و درێژە ۲. دوێردێک بە تێخەگەلی باریکەوە.

**دمبدم** / dambedam/: قید. پەیتاـپەیتا؛ هەیتاـپەیتا؛ هەیتاـهەیتا؛ پەساپەس؛ پەستاـپەستا؛ پەساـپەسا؛ لە پەسا؛ دەمایدەم؛ دەماودەم؛ دەمبەدەم؛ زووـزوو؛ بێوچان؛ هەمیشە؛ لە ماوەگەلی کەمدا ‹دمبدم می‌آمد و پول می‌خواست: پەیتاـپەیتا ئەهات و پارەی دەویست›: **دمادم**

**دمبرگ** / dombarg ، ـها؛ ـان/: اسم. [گیاه‌شناسی] قینچک؛ قەنچک؛ دووچکەگەلا؛ لقێکی ناسک کە پانایی گەلا بە لاسکەوە دەلکێنێ.

**دمبریده** / domborîde ، ـها/: صفت. [کنایی، گفتاری] ۱. دوابڕاو؛ دوابڕیاو؛ دوابڕیاگ؛ دووبڕیای؛ وریای ئاوژێرکا ‹از این دم‌بریده هر کاری برمی‌آید: ئەم دوابڕاوە هەموو کارێکی لێ دێ›.

**دمبک** / dombak/ ☜ **تُنبَک**

**دمبل** / dambel ، ـها/: [انگلیسی] اسم. دەمبل؛ مێلەیەکی کورت بە دوو گۆی هاوکێش یان پەڕەگەلی ئاسنی لەم لا و لەو لایدا، بۆ چەشنێک وەرزش.

**دمپایی** / dampāyî ، ـها/: اسم. سەرپایی؛ شمشک؛ شمک؛ پاپووچە؛ سووکەپێلاو؛ سۆل؛ مداس؛ مەهس؛ پالالە هەمانە؛ سووکەسۆل؛ نالک؛ سووکەڵەی بێپاینە؛ دەرپا؛ پێڵاوی ڕاحەتی سووکی بێپشت و پاژنە یان پاژنە کۆتا کە زوو لە پا دەکرێ.

▣ **دمپایی چوبی**: قاپقاپ؛ تەق‌تەقیلە؛ سەرپایی لە دار چێکراو.

**دمپختک** / dampoxtak/: اسم. باقلەپلاو؛ شێوی برنجی نەپاڵێوراو بە باقلەی وشکەوە.

**دمپر** / damper/: [انگلیسی] ☜ **دامپِر**

**دمپر** / dompar ، ـها/: اسم. دووچکە؛ جووچکە؛ پەڕی سەر کلکی باڵندە.

**دم‌پهن** / dampahn ، ـها/: اسم. دەمپان: ۱. چەشنێ ئەمۆردەست بە دەمی پان و درێژەوە کە بۆ بڕین و قرتاندن بە کار دەڕوا: **دم‌تخت** ۲. چەکوچی سەر پان ۳. دوێردێک بە تێغەی پانەوە.

**دمپینگ** / dampîng/: [انگلیسی] ☜ **دامپینگ**

**دم‌تخت** / damtaxt/ ☜ **دم‌پهن‌ـ۱**

**دم‌جنبانک** / domcombānak, -conbānak/: اسم. کلک‌هەڵتەکێنە؛ کلک‌تەقێنە؛ کلک‌تەقنە؛ قنگ‌هەڵتەکێنە؛ فیسقە؛ کلک هەڵسەنگێنە؛ جقە؛ پەیتووکە؛ سۆفیلە؛ توترواسک؛ قین‌لەقنە؛ عنەوەسۆنگلێ؛ دوهەژینک؛ گاچەڕینک؛ گاچێرین؛ بەرگاییلکە؛ بەرگایلە؛ بەرگایلکە؛ گاویلکە؛ بەرگاویلە؛ گایلکە؛ دووڤڕەپ؛ هەڤلەرزینک؛ پەلەوەرێکی قەراخ ئاو ژیە، بە جەستە و پا و دەندووکی باریک و جووچکەیەکی درێژەوە کە هەر هەڵیدەتەکێنێ و لە زەوین یان لە تۆی بەردا هێلانە دەکا و لە مێروو یان گیا دەخوات: **آبدارک؛ سَقاهک**

**دمخور** / damxor/: اسم. هاودەم؛ هاوتەک؛ هاواڵ؛ هاودەنگ؛ هۆگر؛ ئەوەی هەمیشە لەگەڵ کەسێک هاوقسە و هاوڕێیە ‹چقدر به تو گفتم با این آدمهای بد دمخور نشو: چەندە پێم گوتی لەگەڵ ئەم نەپۆڕانەدا هاودەم مەبە›.

**دمدار** / damdār/: صفت. هەڵماوی؛ هەڵمن؛ هەڵمین؛ بۆقدار.

**دمدار** / domdār ، ـها؛ ـان/: صفت. کلکدار؛ جووچکەدار؛ دووچکەدار؛ قلیچکەدار؛ کلکن ‹میمونهای دمدار: مەیموونگەلی کلکدار›.

**دمدستی** / dam(e)dastî ، ـها/: صفت. بەردەست؛ دوودەسی؛ بەردەس؛ بەردەستی؛ لەبار و ڕەچاوکراو بۆ کاری ڕۆژانە یان کەڵک وەرگرتنی خێرا ‹ظرفهای دم‌دستی: دەفرگەلی

بەردەست›.

**دمدمه** / damdame ، ـها/: *اسم. [مجازی، ادبی]* ۱. دەهۆ؛ دهۆ؛ شات و شووت؛ فاکوفیک؛ قسەی فریودەر ‹به دمدمەی شما فریفته نگردم: بە دەهۆی ئێوه ناخەڵەتێم› ۲. دەنگ؛ هەرا؛ ئاواز ۳. حەلەق مەلەق؛ وتەی نەشیاو ٤. ناوبانگ؛ ئاوازە.

**دم‌دمهـا** / damdamhā/: *قید.* دەمەدەمان؛ دەمدەما؛ نزیک؛ لا؛ نێزیک بە کاتێ ‹دم‌دمهای صبح؛ دم‌دمهای غروب: دەمەدەمانی بەیانی؛ لای ئێوارە›: **دم‌دمەها**

**دم‌دمەها** / damdamehā/ ☜ **دم‌دمها**

**دمدمی** / damdamî/: *صفت. [گفتاری]* وازی-وازی؛ وازوازی؛ ڕا- ڕا؛ تاوتاوی؛ وەسواس؛ دەمەدەمی؛ هۆکی؛ هۆکی- هۆکی؛ شێتە و ژیرە؛ لێزۆکی؛ شێتەوێژ؛ سەرسەری؛ حولحولی؛ هەردەبیر؛ هەردەمی؛ هەردەم لە سەر خەیاڵێک ‹من نمی‌توانم با این آدم دمدمی زندگی کنم: ناتوانم لەگەڵ ئەم کابرا وازوازیەدا بژیم›.

**دمدمی‌مزاج** / damdamîmezāc, -mazāc ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت.* عەنتەرمەزاج؛ سەرسەری؛ وازی- وازی؛ واز- وازی؛ گرێ-گرێ؛ بێبار؛ هوکی؛ ڕا-ڕا؛ بەبێ ویست و پێداگری و هەر تاوێک لە سەر بەزمێک.

**دمده** / demode/: [فرانسوی] *صفت.* لاکەوتە؛ بێ باو؛ باونەماو؛ ناباو؛ لەباوکەوتوو؛ لە باوکەوتوو ‹این لباسها دیگر دمده شده است: ئەم جل‌وبەرگانە ئیتر لاکەوتە بووگن›.

**دمـر** / damar/: *قید. [گفتاری]* ۱. دەمەوروو؛ دەمەوڕۆ؛ دەمەوخوار؛ سەرەمڕ؛ بە دەمەوە؛ بە سکەو؛ بە سکا؛ دولۆڕ؛ دولۆرە؛ لەپەوروو؛ تللوور؛ لنگەتلوور؛ لنگەوتلوور؛ بەراپشت؛ کشتکانی؛ ڕوو بە زەوی و پشت بە ئاسمان ‹دمر افتاده بود روی زمین: دەمەوروو کەوتبووە سەر زەوی› ۲. ئاوەژوو؛ بەراوەژوو؛ ئاوەژۆ؛ دەرنخون؛ دەرنەخوون؛ سەرنخوون؛ سەرەونخوون؛ وەرگەڕاو؛ واژی؛ هەڵەوگەڕیاگ؛ وەڵەودیم؛ بەراوەژۆ؛ بە باری خۆدا نەکەوتوو ‹بشقاب را دمر گذاشت روی میز: دەوریەکەی ئاوەژوو نایە سەر مێزەکە›: **دَمرو**. هەروەها: **دمر افتادن؛ دمر خوابیدن؛ دمر شدن؛ دمر کردن**

**دمرو** / damrû/ ☜ **دَمَر**

**دمساز** / damsāz/: *صفت. [مجازی، ادبی]* ۱. هاودەنگ؛ هاوڕاز؛ هاودەم؛ هاونشین ۲. هاوبیر؛ هاوڕا؛ هامڕا؛ هەڤگر.

**دم‌سنج** / damsanc ، ـها/: *اسم.* هەناسەپێو؛ ئامێری ئەندازەگرتنی هەوایێ کە لە هەناسەداندا ژوور و دەر دەکا.

**دمسیاه** / domsiyāh/: *اسم.* دومسیاه؛ چەشنێ برنجی باش کە دوچکەی دەنکەکانی لە ڕەش دەکا.

**دمغ** / damaq/: [از عربی] *صفت. [گفتاری]* مات؛ واق؛ پەکەر؛ ڕەنجاو ‹وقتی که گفتم کار من نیست، خیلی دمغ شد: کاتێ کە گوتم کاری من نیە، زۆر مات بوو›: **دمق**

**دمغازه** / domqāze/: *اسم.* قارچک؛ یەکەمین ئێسقانی کلکی گیانەوەر، بە شوێن کلێنچکەدا.

**دمق** / damaq/: (!) [از عربی] ☜ **دَمَغ**

**دم‌قیچی** / damqeyčî ، ـها/: [فارسی/ ترکی] *اسم.* دەمەدوێر؛ دەمەقەیچی؛ کوت و لەتە ماوەی چکۆلە کە لە برینی پارچە، کاغەز و... بەدی دێ.

**دم کج** / damkac ، ـها/: *اسم.* دەمەلار؛ دەمگێڕ؛ چەشنێ ئەمۆردەستی دەمباریک بە نووکێکی هەڵگەڕاوەوە.

**دمکرات** / demokrāt/: [فرانسوی] ☜ **دِمُوکرات**

**دمکراتیک** / demokrātîk/: [فرانسوی] ☜ **دِمُوکراتیک**

**دمکراسی** / demokrāsî/: [فرانسوی] ☜ **دِمُوکراسی**

**دم‌کرده** / damkarde/: صفت. ۱. دەمکراو؛ دەمکێشاو؛ ئامادەکراو لە ڕێگەی دەم‌کردنەوە (سەبارەت بە ماکی گیایی) ۲. هەڵماوی؛ هەڵمن؛ بۆق‌کردوو ‹هوای دم‌کرده: کەشی هەڵماوی›.

**دمکش** / damkeš/: اسم. دەمکێش؛ پەڕەیەکی کانزایی کون‌ـ‌کون کە بۆ کەم‌کردنەوەی تین و بەرگری لە تاوی ڕاستەوخۆی ئاگر لە سەر کوانوو، چرا یان سەماوەری دادەنێن.

**دم‌کلفت** / domkoloft، ـها/: صفت. [تعریض، گفتاری] مل‌قەوی؛ سەرزل؛ سەرقەو؛ خاوەن هێز و کارا ‹رفت یک پارتی دم‌کلفت پیدا کرد: چوو پارتییەکی سەرقەوی دۆزیەوە›.

**دمکنی** / damkonî، ـها/: اسم. مادە؛ مادێ: ۱. ماگە؛ ڕفیدەی مەنجەڵ؛ شتێکی وەک دۆشەکێکی چکۆلەی خڕ بۆ بەرگری لە دەرچوونی هەڵم و دەمکێشانی شێو (بەتایبەت برنج) کە لە سەر دەفری دادەنێن ۲. پارچەیەکی ئەستووری چەند لۆ کە بۆ دەمکێشانی چایی دەیکێشنە سەر قۆریدا.

**دمگاه** / domgāh/: اسم. دووگا؛ پاشەڵی پەلەوەران.

**دم‌گرد** / damgerd، ـها/: اسم. دەم‌گرد؛ دەم‌خرت؛ جۆرێک ئەمۆردەستی دەم‌باریک کە نووکەکەی خرتە و بۆ پێچاندنی سیم و شتی وا دەبێ.

**دمگل** / domgol، ـها/: اسم. قینچک؛ قەنچک؛ دووچکەگوڵ؛ باریکە ڕسێ کە گوڵ بە لاسکەوە دەلکێنێ.

**دمل** / domal، ـها/: [عربی]اسم. ئارێنج؛ کوان؛ کونک؛ کولک؛ کۆن؛ کۆڤان؛ کوڤان؛ کەوەن؛ پرزک؛ ئاشین؛ کونێر؛ قونێر؛ گۆنر؛ چافک؛ پەڤیژۆک؛ مادە؛ لۆک؛ هاڵی؛ دومەڵ؛ دمەڵ؛ دومەڵە؛ دومل؛ دومڵ؛ بلۆقی چلکینی بە ژان کە لە ژێر پێستەوە دەردێ ‹زیر بغلش یک دمل درآمده: لە ژێر باڵیەوە زیپکێک دەرهاتووە›.

◙ **دمل خونی**: کوانی خوێنی؛ دومەڵێک کە بە هۆی گرسانی خوێن لە جێگایەکی نائاساییدا دەردێت.

**دمل ریه**: کوانی سی؛ کوانێ کە بە هۆی نەخۆشی سی، ڕۆچوونی خوێن، چڵک یان هەر شتێکی دەرەکی بۆ ناو سی، لە سیپەلاکدا بەدی دێ.

**دمن** / daman/: اسم. [ادبی] داوێن؛ دامێن؛ دامێنە؛ داوێنە؛ داینە؛ ئاتەگ؛ پەلە؛ گۆرت؛ پاڵداوێن؛ پاڵدامێن؛ پێ‌دەشت؛ پادەشت؛ وەرپاڵ؛ بەرپاڵ؛ بنار؛ بناری کێو؛ بناری چیا ‹دشت و دمن: دەشت و داوین›.

**دم‌نگار** / damnegār، ـها/: اسم. دەمە؛ دەمنە؛ ئامێری نووسینی خێرایی و قووڵی هەڕازانی هەناسە.

**دمنه** / damne/: [از کردی]اسم. دەمە؛ دەمنە؛ گولبێنە؛ گولوێنە؛ گولوو؛ کولوونە؛ کونی بنەوەی تەنوور بۆ هەناسەدان و گڕ خۆشبوونی.

**دمنه‌بند** / damneband/: [از کردی]اسم. دەمنەبەن؛ گولواخن؛ گولبێنەئاخن؛ تۆپە پەڕۆی کپ‌کردنی دەمە بۆ دامرکاندنی ئاوری تەندوور.

**دمور** / damûr/: اسم. ویرە؛ لۆرە؛ ورە؛ سۆزە؛ ئاوازی هێواش و لە ژێر لێوەوە.

**دم‌ودستگاه** / dam-o-dastgāh/: اسم. دام و دەزگا: ۱. تەواوی دەسگا و ئامێرگەلی کەس، مەزرینگە یان ڕێکخراوەیەک ۲. [گفتاری] هنگ و ونگ؛ دەبدەبە و کەبکەبە؛ سامان و گڕنووز ‹در آنجا دم و دستگاه مفصلی راه انداخته بود: لەوێ دام و دەزگایەکی قورسی ڕێ‌خستبوو›.

**دموکرات** / demokrāt، ـها/: [فرانسوی] صفت. دیموکرات: ۱. هۆگری ڕژیمی دیموکراسی ۲. ئەندام یان هۆگری حیزبی دیموکرات (لە ولاتانی جۆراوجۆردا) ❋ **دمکرات؛ مردم‌سالار**

**دموکراتیک** / demokrātîk/: [فرانسوی] صفت. دیموکراتیک؛ پێوەندیدار یان سەر بە

دیموکراسیەوە: **دمکراتیک؛ مردم‌سالارانە**

**دموکراسی** / demokrāsî، ـها/: [فرانسوی]/*اسم*. دیموکراسی: ۱. سیستەمێک کە هەر تاکێکی کۆمەڵگا تێیدا مافی هەیە ئازادانە و بێ‌بەرهەڵست هەڵویست و بڕیار لە سەر بابەتەکانی ئەو کۆمەڵگایە بدا و لە هەڵ و بەرهەم و کار و ئەرکی ئەو کۆمەڵگایەدا هاوبەش بێ ۲. گەل‌مەزنی؛ نیزامێکی سیاسی کە کاربەدەستانی حکوومەت لە لایەن خەڵک یان نوێنەرانیانەوە هەڵدەبژێردرێن و لە هەمبەریانەوە بەرپرسن ۳. گەل‌مەزنی؛ یەکەیێکی سیاسی وا کە تێیدا دەنگی زۆرینە ڕاژۆرە * **دمکراسی؛ مردم‌سالاری**

**دموگرافی** / demogrāfî/: [فرانسوی]/*اسم*. ئاپۆرەناسی؛ جڤات‌ناسی؛ جەماوەرناسی.

**دمونستراسیون** / demonsterāsyon, demonstrāsiyon، ـها/: [فرانسوی]/*اسم*. *[سیاست]* گەلەکۆیی؛ کار یان ڕەوتی خۆپیشاندان؛ خۆ شاندان؛ ڕێ‌پێوان.

**دموی** / damavî، ـها/: [عربی] *صفت*. خوێنی؛ پێوەندیدار بە خێنەوە.

**دموی‌مزاج** / damavîmezāc, -mazāc، ـها/: [عربی] *صفت*. خۆش‌دەماخ؛ خاوەن ڕۆحێکی بزۆز و گەشبین.

**دمه** / dame/: *اسم*. کرێوە؛ کرێوە؛ کرێڤە؛ کلافە؛ باسریشک؛ بازریشک؛ باکوزیک؛ باپوک؛ باووە؛ بادەوە؛ گیت؛ دەمە؛ شلێوە؛ باروڤە؛ باپوسکە؛ باهوڕ؛ ورەبا؛ هۆڕەبا؛ باهۆڕ؛ کزەبای توندی بە بەفرەوە.

**دمی** / damî/: *اسم*. *[مخفف]* باقلەپلاو؛ شێوی کەتە و باقلەی وشک.

**دمی** / domî/: *صفت*. کلکی؛ جووچکەیی؛ دووچکەیی؛ پێوەندیدار بە کلکەوە.

**دمیدن** / damîdan/: *مصدر*. *لازم*. *متعدی*. //**دمیدی**: هەڵاتی؛ **می‌دمی**: هەڵدێی؛ **بِدم**: هەڵبێ// ☐*لازم*. ۱. هەڵاتن؛ هەڵهاتن؛ ئەڵاتن؛ هلاتن؛ ئەنگووتن؛ ئەنگوتن؛ گەڤلین؛ زەیقین؛ زیەی؛ زیای؛ وەرکەتن؛ دەرهاتن؛ دەرکەوتن؛ کەوتن؛ هۆرئامەی؛ هۆرئامای؛ بەرئامەی؛ بەرئامای؛ دیاری دانی خۆر، مانگ یان ئەستێرە ‹آفتاب دمیدن: خۆر هەڵاتن› ۲. دەرهاتن؛ شین بوون؛ سەوز بوون؛ دەم دان؛ ڕوان؛ ڕپان؛ بەرئامەی؛ بەرئامای؛ ڕسەی؛ ڕسای؛ هاتنە دەرەوەی گیا لە زەوین ‹دمیدن گل: دەرهاتنی گوڵ› ☐ *متعدی*. ۳. هەڵدان؛ فوودان؛ دەماندن؛ دەمانن؛ دەمین؛ دەمنەی؛ دەمنای؛ تووڕاندن؛ تووڕنای؛ دەڤ دان؛ دەم دان؛ پف‌کردن؛ پف دان؛ فوو تێکردن؛ فوو ئەنەکەردەی؛ با کردنە نێو شتێکەوە ‹کوره را دمیدن: دەماندنە کوورەوە› ٤. *[قدیمی]* دەماندن؛ دەمانن؛ دەمنەی؛ دەمنای؛ بە دەمنە با گەیاندنە ئاگر و ئایساندنی. هەروەها: **دمیدنی**

■ صفت فاعلی: **دمنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **دمیده** (هەڵاتوو)/ مصدر منفی: **نَدمیدن** (هەڵنەهاتن)

**دنائت** / denā'at, danā'at/: [عربی]/*اسم*. *[ادبی]* سپڵەیی؛ خوێرییەتی؛ خوێرپایەتی؛ ناکەسی؛ نانەجیبی؛ پەستی.

**دنبال** / dombāl, donbāl/: *اسم*. *[نامتداول]* شوێن؛ شۆن؛ شۆنی؛ شوون؛ دوا؛ دویڤ؛ دما؛ پەی؛ پاش؛ پاشەڵ؛ ڕواڵ؛ واهوو؛ تانتوو؛ پشت سەر؛ پەشتە سەر ‹او از پیش می‌رفت و من در دنبال: ئەو لە پێشەوە دەچوو و منیش بە شوێنیدا›.

⊡ **به دنبال** ☜ **دنبال**

⊡ **دنبال کردن**: شوێن‌کەوتن؛ بە دوادا کەوتن؛ کەوتنە شوێن؛ لە شوون چین؛ وە دووکەوتن؛ کەوتنە دوو؛ کەوتەی شۆنی؛ دانە پەی؛ شۆن گێرتەی؛ لە پەی چوون؛ نیانە شوێن؛ شۆنیەوە نیەی/ نیای؛ بە دوا چوون؛ لوەی/ لوای شۆنیەرە؛ ڕاماڵ نیەی؛ جەنیقاندن (لە ڕاودا)؛ ڕانان؛ ڕاونان؛ دانە دوو ‹خرگوش را دنبال کرد و رفت: کەوتە شوێن کەروێشکەکە و ڕۆیشت›.

**دنبال** / dombāle, donbāle/: *حرف.* بە شوێن؛ شوێنی؛ شۆنۆ؛ وە شۆن؛ دوا؛ لدویڤ؛ ل پەی؛ ل پشت؛ دماو: ١. پشتە سەری کەسێ یان شتێ لە کاتی ڕۆیشتندا ‹دنبال مادرش راه افتاد: بە شوێن دایکیدا کەوتە ڕێ› ٢. لە گەڕان بۆ شتێک پەیدا کردن و بە دەست هێنانی ‹دنبال دکتر رفتن: بە شوێن دوکتوردا چوون› ❊ **بە دنبال**

◘ **دنبال چیزی بودن:** بە دوای شتێکدا بوون؛ بە شوێن چتێکا بوون؛ شۆنۆ چێوێویەوە بیەی ‹معلوم نبود آن وقت شب دنبال چیست؟: دەرنەکەوت لەو تاریکانی شەوەدا بە دوای چیەوەیە؟›.

**دنبال چیزی رفتن:** بە دووی شتێکدا ڕۆیشتن؛ چوون بە شوێن چتێکا؛ شۆنۆ چێوێویەرە لوەی؛ بە شوێن شتێکا ڕۆیشتن؛ بۆ بە دەست هێنانی شتێ یان ئەنجامدانی کارێک ڕۆیشتن ‹رفته بود دنبال کار: بە شوێن کاردا چووبوو›.

**دنبال چیزی گشتن:** بە دوای/ شوێن/ دووی شتێکدا گەڕان؛ لە دوای/ شوێن/ دووی شتێکدا گەڕان؛ شۆنۆ چێوێویەرە گێڵەی ‹توی جیبش دنبال پول خرد می‌گشت: لە گیرفانیدا بە دوای پوولەوردە دەگەڕا›.

**دنبال خود انداختن:** خستنە شوێن/ دوای/ دووی خۆ؛ بە/ لە شوێن/ دوای/ دووی خۆ خستن؛ بە/ لە شوێن/ دوای/ دووی خۆدا بردن؛ وسەی شۆنۆ ویرە؛ ئەرەشۆنۆ وێ وسەی ‹دو نفر را هم دنبال خودش انداخته و آورده بود: دوو کەسیشی خستبووە شوێن خوی و هێنا بوونی›.

**دنبال کسی افتادن:** کەوتنە شوێن کەسێ؛ شوێن کەسێک کەوتن/ گرتن؛ شوێن کەسێ هەڵگرتن؛ بە شوێن کەسێکدا چوون: ١. کەوتنە دووی کەسێکەوە؛ بە دوای کەسێکدا ڕۆیشتن؛ لە پەی کەسێکا چوون؛ کەوتەی شۆنۆ یوی ٢. *[تعریض]* پشتی کەسێک گرتن؛ لە کەسێ لایەنگری کردن ‹یک وقتی هم دنبال صدام افتاده بود: ماوەیەکیش کەوتبووە شوێن سەدام›.

**دنبال کسی رفتن:** بە شوێن کەسێکدا چوون؛ بە دووی کەسێکدا ڕۆیشتن؛ شۆنۆ یۆیەرە لوەی؛ کەوتەی شۆنۆ یۆی ‹رفت دنبال دکتر: بە شوێن دوکتوردا چوو›.

**دنبال نخود سیاه فرستادن:** *[کنایی]* بۆ دەسەسەرەکە ناردن؛ بردن بۆ ڕاوە ژیشک/ ژووژووەڕاو؛ لە ژوانی ژێرکان دانان؛ حەواڵەی سەر چاڵەبەفرکردن؛ کەسێ بە بیانوویێک بۆ بە دەست هێنانی شتێکی دوورەدەست لە جێگایەک دوور خستنەوە ‹بچەها را فرستادند دنبال نخود سیاه و با هم رفتند سینما: منداڵەکانیان نارد بۆ دەسەرسەرەکە و پێکەوە چوون بۆ سینەما›.

**دنبالچه** / dombālče, donbālče/: *اسم.* کلێچە؛ قلێچە؛ قلێنچک؛ کەلێژ؛ کلیژ؛ کلێنچکە؛ کلێنچە؛ کلینچک؛ تەری؛ قەمچک بزدوو؛ بزوو؛ جووچکە؛ سمرە؛ ئێسکگەلی خوارووی مۆغەرەی پشت کە پێکەوە لکاون و لە مرۆدا بریتی لە سێ تا پێنج مۆرەی کورتەوەبووە.

**دنباله** / dombāle, donbāle، ـها/: *اسم.* کلکە: ١. چاک؛ بەشێ لە شتێک (وەک جلوبەرگ) کە لە دواوە شۆڕ بووەتەوە ‹دنبالەی پیراهن: چاکی گنج› ٢. درێژە؛ پاشکۆ؛ پاشماوە؛ بەشێ لە شتێک کە بە دوای بەشی پێشوویدایە ‹دنبالەی داستان؛ دنبالەی راه: درێژەی چیرۆک؛ درێژەی ڕێگە› ٣. دوا؛ بەشی پشتی ‹دنبالەی کشتی: کلکەی کەشتی› ٤. *[ریاضی]* ڕیزێکی دوادار یان بێ‌بڕانەوە لە ژمارە یان ڕستەگەلی جەبری کە بە پێی قانوونێک بە دووی یەکدا دێن.

◘ **دنباله پیدا کردن:** درێژە ساندن/ گرتن؛ بەردەوام بوون؛ کۆتایی نەهاتن؛ دوایی نەهاتن و هەر لە ئارادا بوون ‹گرفتاری او دنباله پیدا کرد و کار به دعوا و طلاق کشید: گرفتەکانی درێژەی

ساند و کار کێشایە شەڕ و جیایی›.
**دنباله داشتن:** درێژەدار بوون؛ درێــژە هــەبوون؛ کلکەدار بوون؛ ناتەواو بوون ‹این داستان دنباله دارد و بە این زودی تمام نمی‌شود: ئـەم ڕووداوە درێژەدارە و بەم زووانە تەواو نابێ›.

**دنبالــه‌دار** / dombāledār, donbāle- ، ـهـا/: *صفت.* ١. دووچکەدار؛ کلکدار؛ کلکـن؛ دوایـیـدار؛ کلکەدار؛ پاشڵدار؛ بـە دوایـی ‹بادبادک دنبالـه‌دار: بەرزەحەوایلەی دوچکەدار› ٢. درێـژەدار؛ هێـشتا کۆتـایی نــەهاتوو ‹داســتان دنبالــه‌دار: چیرۆکــی درێژەدار›.

**دنبالــه‌رو** / dombālerow, donbāle- ، ـهـا؛ ـان/: *صــفت.* شــوێنگر؛ شــوێنکەوتوو؛ شــوێنکەوتە؛ شۆنکەوتە؛ شوێن کەفتە؛ وەدواکەوتە؛ خاوەن خۆ و ئۆگرەتی شوێن‌کەوتوویی.

**دنبالــه‌روی** / dombāleravî, donbāleravî ، ـــهـــا/: *اســم.* شــوێنگری؛ شــوێن کەفتــەیی؛ وەدواکەوتـــەیی؛ ڕەوتی بـــە دوادا چـــوون و وەرگرتنی ڕێباز و ڕێنوێنی و شێوەکاری کـەس یان کەسانێک ‹اعتقادات ما همه دنباله‌روی گذشتگان اسـت: بـیر و بـڕوای ئێمــە هــەمووی شــوێنگری ڕابردووانە›.

**دنبک** / dombak, donbak/ ☜ **تُنبَک**

**دنــبلان** / dombalān, donbalān ، ـهـا/: *اسم.* کــدارک؛ کــدادک؛ کوفکــارک؛ کــەمبولۆک: ١. دومبــەڵان؛ دونبــەڵان؛ دمبــەڵان؛ دمــەڵان؛ دۆبــەڵان؛ دونبەڵـمان؛ چمــە؛ کیــارک؛ کمــێ؛ گونەڵان؛ هێلکەگونی چوارپێیانێ کـە گۆشـتیان دەخورێ ‹دنبلان گاو: دومبەڵانـی گا› ٢. گونەڵان؛ کەبابی دومبەڵان ٣. گەپلە؛ کەیارک؛ کارگ؛ لە چەشنێک کارگی خۆراکی کە لە ژێر خاکـدان و ڕووەکەی خڕە و بە ڕەنگی ڕەش، خۆڵەمێشی و سپی لە سروشتدا هەیە.

**دنبــه** / dombe, donbe/: *اسـم.* ١. دووگ؛ دوو؛ دووگە؛ دمە؛ دوف؛ دیڤ؛ دونـگ؛ دووڤ؛ تــەری؛ ساکەتە؛ دومی؛ کۆمە بـەزی ژێـر پاشەڵـی مـەڕ ٢. پاشەڵی مەڕی ئاسیایی.

**دنج** / denc/: [ترکی] *صفت.[گفتاری]* مەند؛ مەن: ١. ئـامۆش؛ هـامۆش؛ خـامۆش؛ کـونج؛ فـەنا؛ خەڵوەت؛ خاڵوەت ‹یک گوشەی دنج پیدا مـی‌شد خوب بـود: کـونجێکی [illegible] ببوایێ چـاک دەبـوو› ٢. تەریک؛ ئارام؛ بێ‌دەنـگ و قـاڵ ‹خانـەی دنـج خوبی داری: ماڵێکی [illegible] باشت هەیە›.

▣ **جای دنج** ☜ **جا**[1]

**دندان** / dandān ، ـها/: *اسم.* ددان؛ دنان؛ دیـان؛ دگان؛ دران؛ دزان؛ دندان؛ دان؛ دنوو؛ هەر یەکـە لــە ئەنــدامانی ســەختی نێــو زار کــە لــە ســەر شەویلکەی مۆغەرەدارانەوە دەڕوێن و بۆ جوین و داکرۆژتنی خۆراک یان وەک ئامێری بەرەنگاری بە کەڵک دێن.

▣ **دندان** آسیا: کاکیلە؛ کاکیلکە؛ خلێنە؛ خرێنە؛ خریپ؛ خرێ؛ هەر کام لە چوار ددانێ (ئەگـەر ددان عەقڵیش دەرهاتبێ پێنج) کە لە هــەر دوو لای شەویلکەکانەوە دەردێـن و بـۆ جـاوین و ساوینی پاروو بە کار دێن: **دندان کرسی**

**دندان پیش:** بڕە؛ کێلب؛ کەڵپ؛ کێلبـە؛ ددانی پـێش؛ دگـان بـەر؛ هـەر کـام لـەو ددانانـەی پێشەوە کە بۆ بڕین و هەڵکەندن بە کار دێن: **ثَنایا**

**دندان دایمی:** ددانی هەمیـشەیی؛ هـەر کـام لەو ٣٢ ددانەی مـرۆڤ کـە بـە دوای حـەوت ساڵەییدا دەردێن.

**دندان شیری:** ددانی شـیری؛ ددانی حـەوت ساڵە؛ هەر کام لەو ٢٠ ددانە کە لە منـداڵانی شیرەخۆرەدا لە دوای شەش مانگیەوە تـا دوو سـاڵان دەردێـن و لـە دەور و بـەری حـەوت ساڵەییدا دەکەون.

**دندان عاریه:** *[گفتاری]* ددانی دەسکرد؛ تاقم.

**دندان عقل:** کورسـی؛ خلێنـە؛ ددانی عـەقڵ؛ ئــاخرین ددانی هــەر دوو لای شــەویلکەی

مرۆڤ کە دوای هەژدە ساڵەیی دەردێن و جارجارەیش هەر دەرنایەن.

دندان کرسی ☜ **دندان آسیا**

دندان کرم‌خورده: ددانی خوراو؛ ددانی کرمۆڵ؛ ددانی قرۆڵ؛ ددانی کرم‌خواردوو؛ ددانێ کە پواوە.

دندان مصنوعی: تاقم؛ ددانی دەسکرد؛ دنودەرکی؛ دنون دەشەکی؛ دنان عاریە؛ ددانێ کە بە دەستی ددانساز چێ دەکرێ و لە جێی ددانە نەماوەکان بە کار دەبرێن.

دندان نیش: چیر؛ درۆک؛ چوار ددانی نووک‌تیژ کە لە هەر دوو لای شەویلکەوە لە نێوان ددانی بەر و کاکیلەوە دەردێن.

▣ دندان پر کردن: ددان پڕکردنەوە؛ دیان پڕکردن؛ ددان پەڕەوەکەردەی؛ چاکردنەوەی ددانگەلی کرمۆڵ یان سەرکەل بە دەستی ددانبژیشک ‹دکتر دو تا دندانم را کشید و یکی را هم پر کرد: دوکتور دوو ددانی کێشام و دانێکیشی پڕ کردەوە›.

دندان تیز کردن: *[کنایی]* ددان تیژکردنەوە؛ مرخ لێ خۆش‌کردن؛ تەماح تێکردن؛ گیڤ بوون و خوازیاری وە چنگ خستنی شتێک بوون ‹آقایان برای ده علی‌آباد دندان تیز کرده بودند: سەرزلان بۆ ئاوایی عەلی‌ئاوا ددانیان تیژ کردبووەوە›.

دندان چیزی/ کاری را نداشتن: ددانی شتێ نەبوون؛ ددانی ساق بۆ خواردنی شتێ نەبوون ‹پسر جان! من دندان سنگک خوردن ندارم: کوڕەکەم! من ددانی نانی خواردنم نییە›.

دندان درآوردن: ددان دەرهێنان؛ دیان دەرهاوردن؛ ددان زنیەی؛ دەرهاتنی ددان و داندار بوون ‹بچه از شش ماهگی دندان درمی‌آورد: مندال لە شەش مانگییەوە ددان دەردێنێ›.

هەروەها: **دندان درآمدن**

دندان روی جگر گذاشتن: *[مجازی]* ددان بە خۆوەگرتن؛ دیان نانە خۆدا؛ ددان بە سەر جەرگدا نان؛ لە بەرانبەر دەرد و زەحمەتەوە تابشت هێنان و دەنگ نەکردن ‹دندان روی جگر گذاشتم و هیچ نگفتم: ددانم بە خۆوەگرت و نقم نەکرد›.

**دندان زدن:** ١. قەپ لێدان؛ قەپگرتن؛ گاز گرتن؛ قەپ‌گێرتەی؛ گازگێرتەی ٢. *[مجازی]* نانە ژێر ددان؛ بە ددان تاقی‌کردنەوە (وەکوو تاقی‌کردنەوەی نەرمی یان سفتی شتێک).

دندان طمع را کشیدن: *[مجازی]* دڵ لێ‌هەڵکەندن؛ لە شتێ چاو پۆشین و چیتر بە شوێنیدا نەچوون.

**دندان کسی افتادن:** ددانی کەسێک کەوتن؛ دیان کەسێ کەفتن؛ ددانوو یۆی کەوتەی ‹یکی از دندانهایش افتاده بود: یەک لە ددانەکانی کەوتبوو›.

**دندان کسی پیش چیزی/ کسی گیر کردن:** *[مجازی]* دڵی کەسێک گیرۆدەی شتێ/ کەسێک بوون؛ دڵ چەقینە سەر کەس/ شتێ؛ زۆر خوازیاری شتێ/ کەسێ بوون ‹دندان آزاد پیش سارا گیر کرده بود: دڵی ئازاد گیرۆدەی سارا ببوو›.

**دندان کسی را شمردن:** *[کنایی]* بە سڕ و تری کەسێک زانین؛ کەسێک بە باشی ناسین و لە عەیبەکانی ئاگادار بوون ‹زن و شوهر دندان هم را شمرده بودند و دیگر از حرف زدن فایده نداشت: ژن و مێردەکە بە سر و تری یەکیان زانیبوو، چیتر قسە و باسێک نەمابوو›.

**دندان کسی را کرم خوردن:** ددانی کەسێک کرمۆڵ بوون؛ ددانی کەسێ تووشی پوواوی بوون ‹یکی از دندانهایم را کرم خورده بود: ددانێکم کرمۆڵ ببوو›.

**دندان کسی را کشیدن:** ددانی کەسێک کێشان؛ دیان کەسێ کێشان؛ ددانوو یۆی کێشتەی.

**دندان کسی ریختن:** ددانی کەسێک کەوتن؛ هەموو یان زۆرێک لە ددانگەلی کەسێک لە شەویلکە جیا بوونەوە و داکەفتنی ‹قدش خمیده و دندانهایش ریخته بود: بالای چەمابووەوە و ددانەکانی کەوتبوون›.

**دندان گذاشتن:** دیان تێ‌کردنەوە؛ ددان نان؛ ددان نیەی/ نیای؛ ددانی دەسکرد نانە جێ ددانی کەوتوو.

**دندان نشان دادن:** *[کنایی]* چاو لێ‌گرتن؛ چاو لێ بزکردن؛ مۆڕ بردنەوە؛ چاو لێ دەرپەڕاندن؛ چاو لێ شکاندن؛ چاو سوورکردن؛ ددان لێ‌چیرکردنەوە؛ لێ چیرەوەکردن؛ هەڕەشە و گوڕەشەکردن ‹با این کار می‌خواست بە او دندان نشان بدهد: بەم کارە دەیەویست گۆشە چاوێکی تێ‌بگرێ›.

**دندانهای کسی کلید شدن:** دەمی کەسێک هاتنە یەک؛ دەم کەسێ چوونە کلێلە؛ زاری کەسێک ڕەق بوون؛ دانی کەسێک دەبەست چوون؛ کرژ بوونەوەی ماسولکەی شەویلاک بە چەشنێ کە نەکرێتەوە.

**باب دندان بودن:** *[کنایی]* باو دڵ بوون؛ شیاوی حاڵ بوون؛ باوشان بوون؛ گیای کەسێک بوون ‹این میوه باب دندانم نیست: ئەم میوە باوی دڵم نیە›.

**به دندان کشیدن:** قەپاندنەوە؛ ئەوەقەپنەی؛ بە قەپ خواردن؛ قەپخۆرکردن؛ بە ددان لێکردنەوە و خواردنی شتێک ‹قاچ هندوانه را برداشت و بە دندان کشید: قاشە شووتیەکەی هەڵگرت و قەپاندیەوە›.

**به دندان گرفتن:** بە ددان گرتن؛ گرتنە دیانەوە؛ گرتنە دەمەوە؛ بە دەم گرتن؛ گیرتەی دەمەوە؛ ڕاگرتن بە دیان ‹گربه بچه‌اش را به دندان گرفت و برد: پشیلەکە بێچوەکەی گرتە ددانەوە و بردی›.

**دندانپزشک** / dandānpezešk, -pezešg ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ددانپزیشک؛ دنانبژیشک؛ دیانپزشک؛ کەسێ کە لە ڕشتەی ددان بژیشکیدا خوێندنی زانسگایی هەبێ.

**دندانپزشکی** / dandānpezeškî, -pezešgî/: *اسم.* ددانبژیشکی؛ دنانپزیشکی؛ زانست و پیشەی ناسینی نەخۆشی و گەزنی ددان و شەویلکە و چۆناوچۆنی دەرمان و چا کردنەوەیان.

**دندان‌درد** / dandāndard/ ☜ **درد**[٢]

**دندانساز** / dandānsāz ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ١. ددانساز؛ دنانساز؛ دانساز؛ دیانساز؛ وەستای دروستکردنی ددانی دەسکرد ٢. *[گفتاری]* ددانبژیشک.

**دندانسازی**/ dandānsāzî/: *اسم.* ددانسازی؛ دیانسازی: ١. پیشەی ددانساز ٢. /ـها/ کارگای ددانساز ٣. /ـها/ *[گفتاری]* سەردانگەی ددانبژیشک.

**دندان‌شکن** / dandānšekan/: *صفت.* *[مجازی]* دەمکوتکەر؛ ددانشکێن؛ زۆر سەخت و ئازاردەر ‹جواب دندان‌شکن: وەرامی دەمکوتکەر›.

**دندان‌قروچه** / dandānqorûče/: *اسم.* ددانەکرۆژە؛ دانەجیرێ؛ ددانەچیرە؛ دیانەکیرە: ١. ریچ؛ دنوریچە؛ چیر؛ کار یان ڕەوتی دان جیر کردنەوە؛ دان چیرکردنەوە؛ چێرەوەکەردەی؛ ڕێک‌خشانی ددانان بە یەکدا، بەتایبەت بە هۆی تووڕەییەوە ٢. *[پزشکی]* کار یان ڕەوتی لێک‌ساوینی ددان لە خەودا. هەروەها: **دندان قروچه کردن/ رفتن**

**دندان‌گرد** / dandāngerd ، ـها/: *صفت.* *[مجازی]* چنۆک؛ چاوچنۆک؛ چاف‌چنۆک؛ چاونەزێر؛ چاوبرسی؛ چافبرسی؛ چلماس؛ چەلماس؛ چەلماسک؛ دەڤبەش؛ پرکێش؛ تەماکار؛ لیشتۆک؛ هەفهەفی ‹خیلی دندان‌گرد است با او نمی‌شود معامله کرد: زۆر چاوچنۆکە و مامەڵەی لەگەڵ ناکرێ›.

**دنـدان‌گـردی** / dandāngerdî ، ـهـا/: *اسـم.* چنـۆکی؛ چـاوچنۆکی؛ چاونـه‌زێری؛ تـه‌ماکاری؛ دۆخ یان چۆنیه‌تی چاوبرسی بوون ‹در معامله نباید دندان گـردی بکنـی: لـه مامه‌لـه‌دا نابـێ چـاوچنۆکی بکه‌ی›.

**دنـدانگیر**[1] / dandāngîr ، ـهـا/: *اسـم.* ددانگـیر؛ ئامێرێک به شێوه‌ی لاستیکێکی ناو بـه‌تاڵ، کـه له کاتی ده‌رهێنانی ددانی زاڕۆدا پێی ده‌ده‌ن به ددان بیگرێ تا ده‌می تاک بێ.

**دندانگیر**[2]: *صفت. [مجازی]* به‌رچاو؛ ده‌ردخواردوو؛ ده‌ردخۆر؛ ده‌ردوه‌ر؛ ده‌رده‌وه‌ر؛ ئه‌وتۆ؛ به هورم و بایه‌خ ‹دزد چیز دندانگیری در خانه پیدا نکرده بـود: دز شتێ به‌رچاوی له ماڵه‌که‌دا نه‌دۆزیبووه‌وه›.

**دنـدان‌موشـی** / dandānmûšî ، ـهـا/: *اسـم.* نه‌خـشێک بـه شـێوه‌ی داڵـبڕ کـه پتـر بـۆ ڕازاندنه‌وه‌ی په‌راوێز و لێواره‌دووری سه‌ر قوماش به کاری ده‌به‌ن.

**دندانـه** / dandāne ، ـهـا/: *اسم.* داڵـبڕ؛ ددانـه؛ دیانه: ١. دن؛ دچ؛ ددانوک؛ دانه؛ چوکڵه؛ قارت؛ ده‌ن؛ هه‌ر کام له قوتکه‌گه‌لی یه‌ک‌ڕیز و یه‌ک له دوای یـه‌ک ‹دندانـه‌ی اره؛ دندانـه‌ی کلیـد: ددانـه‌ی هه‌ره؛ دیانه‌ی کلیل› ٢. *[گیاه‌شناسی]* بره‌ـبـره‌ی لێواره‌ی گه‌ڵا که به شێوه‌ی ددانه‌ن.

**دندانه دار** / dandānedār/: *صفت.* داڵبڕـداڵـبڕ؛ ددانه‌دار؛ دیانه‌دار؛ به دیانه و داڵبڕگه‌لی تیـژ لـه لێوار و که‌ناره‌وه.

**دنـدانی**[1] / dandānî/: *اسـم.* دووپـایی؛ ئاژه‌ڵـی دووکۆیی؛ ئاژه‌ڵێ که بۆ داشـت و به‌شـداری لـه ده‌سهاتی، لای که‌سێکه‌وه داده‌نرێت.

**دندانی**[2]: *صفت.* ددانی؛ دانی؛ دیانی؛ پێوه‌ندیدار یان سه‌ر به ددانه‌وه.

**دنده** / dande ، ـها/: *اسم.* ده‌نـده؛ ده‌نـه؛ ده‌ن: ١. په‌راسوو؛ په‌راسی؛ په‌ره‌که؛ سیـسی؛ ده‌نـگ؛ ده‌نـک؛ ده‌نکـه؛ پارخـان؛ پاروخـان؛ ئێـسکی که‌وانه‌یی له سینگدا ٢. ده‌سگایه‌کی میکـانیکی بۆ گۆڕینی جووڵه، لایه‌ن و خێرایی لـه موتـوردا ‹دنده‌ی یک: ده‌نده یه‌ک›.

◘ **دنده‌ی آزاد**: گه‌نده‌په‌راسوو؛ هه‌ر کام لـه دوو یا سێ‌جووتی خوارینی په‌راسـووی گوانـداران که کورت‌تره و ناگاته ئێسکی سـنگ: **دنـده‌ی کاذب**

**دنده‌ی حقیقی**: په‌راسـووی ڕاسـته‌قینه؛ هـه‌ر کام له حه‌وت جـووتی سـه‌رووی پـه‌راسـووی مرۆ که له به‌ره‌وه به هۆی به‌شی کرۆژه‌یی بـه ئێسکی سنگه‌وه ده‌لکێن.

**دنده‌ی کاذب** ☜ **دنده‌ی آزاد**

◘ **دنده پهن بودن**: *[کنایی]* ته‌پلۆسه/ تـه‌پلمۆس/ ته‌پلۆس/ له‌ش‌گـران/ تـه‌پ/ ترتـه‌پال بـوون؛ ته‌وه‌زه‌ل بوون؛ قنگ قورس بوون.

**دنده چاق کردن**: *[مجازی]* لێ‌خوڕین؛ ئـاژۆتن؛ ڕانه‌نده‌یی‌کردن

**دنده عقب رفتن**: پاشه‌وپاش چوون؛ به‌ره‌و دوا چوون: ١. به‌ره‌و دوا ڕاننده‌یی‌کردن ٢. *[کنایی، گفتاری]* پاشه‌کشه‌کردن؛ به‌ره‌و پاش چوون.

**دنده‌ی کسی خاریدن**: *[کنایی]* کوته‌ک خوران؛ گیان خوران/ خوریان؛ شـان/ لـووتی که‌سـێ لێی خوران؛ شـه‌ق خـوران؛ شـیاوی کوتـه‌ک خواردن بوون ‹مگر دنده‌ات می‌خارد کـه سـربه‌سـر ایـن آدم شـارلاتان گذاشـته‌ای؟: مه‌گـه‌ر کوتـه‌کت ئه‌خورێ، سه‌ر ئه‌نیته سه‌ر ئه‌م کابرا شه‌ڵلاتیه؟›.

**دنده‌ی کسی نرم شدن**: *[کنـایی]* سـلی که‌سـێ سارده‌وه بوون؛ چاو که‌سێ چه‌رمگـه‌و بـوون؛ مردن.

**از دنده‌ی چپ بلند شدن**: *[کنایی]* له‌سه‌ر باری ناله‌بار بوون؛ که‌یف ساز نه‌بوون.

**از این دنـده بـه آن دنـده شـدن**: شانه‌وشـان کردن؛ تل دان؛ له لایه‌که‌وه بـه لایـه‌کی‌تـردا که‌وتن (به‌تایبه‌ت به هۆی بێ‌خـه‌وی یـان خـه‌و زڕانه‌وه).

**دنده‌ای**/ dande'î/: *صفت.* ده‌نده‌یی؛ ده‌نـده‌دار؛

به دەندەوە ‹موتور دنده‌ای: موتوری دەندەیی›.
**دن‌ژوان** / donjûvān/: [فرانسوی]/اسم. [کنایی] ژنباز؛ تۆلاز؛ دۆژەن؛ زرتک؛ کەسێ کە وازی لە ژنانە و وا ناسراوە.
**دن کیشوت** / donkîšot/: [؟] /اسم. [کنایی] پاڵەوان‌پەمە؛ کەسێ کە تووشیاری ئارمانجگەلی نەگونجاو و خەیاڵگەلی پاڵەوانیەتیە.
**دنگ**[1] / dang/: /اسم. ۱. /ـها/ دینگ؛ دنگ؛ سیرکۆ؛ دەسوسندۆڵ؛ چاڵک؛ برنجکوت؛ ئامرازی برنج کوتان ۲. [مجازی] دەنگەشە؛ هەرا و هوریا؛ دەنگ؛ دەنگەدەنگ؛ داکۆکە؛ قیڕە؛ گرم و قاڵ؛ قرم و قاڵ ‹کاری می‌کند که هر روز دنگی درآید: کارێک دەکا هەموو ڕۆژێ دەنگەشەیەک بەرز بێتەوە› ۳. نەوس؛ هەوەس؛ خولیا ‹دنگ کسی گرفتن: نەوسی کەسێ هەستان›.
⊡ **دنگ کسی گرفتن**: [تعریض] کەڵکەڵە کەوتنە سەری کەسێک؛ هەوا کەوتنە سەری کەسێک؛ هەوا لە سەری کەسێک دان؛ هەوا کەسێک گرتن؛ نەوسی کەسێ هەڵسان؛ کەوتنە سەر هەتەرەوە؛ کەفتنە سەر هەواوە ‹اگر فردا دنگت گرفت و نخواستی کار کنی، تکلیف من چیست؟: ئەگەر سبەینێ کەڵکەڵە کەوتە سەرت و نەتویست کار بکەی، چاری من چیە؟›.
**دنگ**[2] ☜ **دنگ ـ دنگ**
**دنگال** / dangāl/: صفت. هەشتەرخان؛ وراق؛ بەرپان؛ زۆر گەورە و بەرفراوان ‹اتاق دنگال؛ کرسی دنگال: ژووری هەشتەرخان؛ قورسی وراق›.
**دنگاله** / dangāle/: /اسم. گلیلە؛ گلیزە؛ گەزووز؛ چلوورە؛ زەمبەلیک؛ زەمبەلیلک؛ زەنبەلولە؛ زەنبەلوویلە؛ بەیسێ؛ شووشە سەهۆڵ؛ سەهۆڵێ کە بە شاخ و گوێسوانەدا شۆڕ دەبێتەوە.
**دنگ‌ـ‌دنگ** / dangdang/: صوت. زرینگەزرینگ؛ زرەزر؛ دەنگی ئاهەنگین و گڕێ کە بە هۆی لێکدانی شتی کانزایی بە دیدێ: **دنگ**
**دنگ‌وفنگ** / dang-o-fang/: /اسم. [تعریض] بەزم و ڕەزم؛ بێ و برۆ؛ فیک‌وفاک؛ کاری بە پێشەکی و پەراوێز و درێژەسان ‹دیدم خیلی دنگ و فنگ دارد، از خیرش گذشتم: زانیم بەزم و ڕەزمی زۆری هەیە، وێلم کرد›.
**دنی** / danî/: [عربی] صفت. [ادبی] ۱. پەست؛ پەس؛ خوێڕی؛ سووک؛ ناکەس ۲. بێ‌فەڕ؛ هیچ‌وپووچ؛ ناچیزە؛ سەرسواڵکەر؛ ناکەس‌بەچە.
**دنیا** / donyā/: [عربی]/اسم. دنیا؛ دونیا؛ دنێ؛ دنا: ۱. جەهان؛ جیهان؛ گەردوون؛ چەرخ؛ سەربسات ‹دنیا خیلی بزرگ است: دنیا گەلەک گەورەیە› ۲. ژیان ‹به دنیا آمدن: هاتنە دنیاوە›. بەرانبەر: **آخرت** ۳. نیشتەجێکانی زەوین؛ دانیشتوانی زەوی ‹دنیا گواه است: دنیا ئەزانێ› ٤. تاقمێکی دیاریکراو لە خەڵک و حەز و خوازگەلی تایبەتیان ‹دنیای ورزش: دنیای وەرزش› ٥. کار و بار و دڵخوازیگەلی سەر بە ژیانی ڕۆژانە ‹از دنیا بریدن: لە دنیا وەڕەز بوون› ٦. جێ ژیان و دەور و بەری هەر کەسێک ‹دنیای کوچکی دارد: دونیایەکی چکۆلەی هەیە›.
⊡ **دنیای جدید** ☜ بر جدید، برّ
**دنیای خاکی**: زەوی؛ زەوین؛ زەمین؛ ئەرز؛ هەرد؛ هەرند؛ عەرد.
**دنیای قدیم** ☜ بر قدیم، برّ
**آن دنیا**: ئەو دنیا؛ دنیای پاش مەرگ؛ جەهانی مردووان ‹در آن دنیا باید جواب پس بدهی: لەو دنیا دەبێ وەرام بدەیەوە›.
**این دنیا**: ئەم دنیا؛ ژیانی دنیایی ‹امیدوارم در این دنیا خوشبخت باشی: هیوادارم لەم دنیایەدا خۆشبەخت بی›.
⊡ **دنیا به آخر رسیدن**: [مجازی] کۆڵەکەی ئاسمان ڕووخان؛ قیامەت ڕاهاتن؛ سەر دنیا هاتنە یەک؛ ڕووداوێکی گرنگ پێشهاتن ‹مگر دنیا به آخر رسیده؟: مەگەر کۆڵەکەی ئاسمان ڕووخاوە؟›.
**دنیا به کام کسی بودن**: ڕۆژ، ڕۆژی کەسێک

بوون؛ ڕۆژی کەسێ بوون؛ کامیاب و خاترجەم بوون ‹امروز دنیا به کام آنهاست: ئەورۆ ڕۆژی ئەوانە›.

دنیا را برداشتن: *[مجازی]* دنیا داگرتن؛ دنیا گرتن؛ لە هەموو جێگایەک بوون ‹بیماری ایدز دنیا را برداشته: نەخۆشی ئەیدز دنیای داگرتووە›.

از دنیا رفتن: کۆچی دوایی کردن؛ لە دنیا (دەر)چوون؛ ماڵاوایی کردن؛ ماڵاوایی یەکجاری کردن؛ مردن ‹آرام بچه بود که پدرش از دنیا رفت: ئارام منداڵ بوو، بابی کۆچی دوایی کرد›.

به دنیا آمدن: هاتنە دنیاوە؛ لە دایک بوون؛ پەیدا بیەی ‹دیشب بچه‌اش به دنیا آمد: دوێشەو منداڵەکەی هاتە دنیاوە›.

به دنیا آوردن: بوون؛ بە دنیا هێنان؛ هاوردنە دنیاوە ‹یک دختر به دنیا آورد: کچێکی بوو›.

دنیاپرست / donyāparast ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دنیاپەرست؛ ماڵپەرست؛ خوازیاری زۆر تامەزرۆی بە دەست هێنانی سامان و دارایی تەنیا بۆ خۆشی و ئاسایشی خۆی: **دنیادوست**

دنیاپسند / donyāpasand/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دنیاپەسند؛ پەسندکراو لە لایەن خەڵکەوە ‹حرفها و سیاستهایش دنیاپسند بود: قسە و سیاسەتەکانی دنیاپەسند بوو›.

دنیادار / donyādār ، ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دنیار؛ پێداگر و سوور لە سەر کۆوەکردنی سامان و پارە.

دنیادوست / donyādûst/: [عربی/ فارسی] ☜ **دنیاپرست**

دنیادیده / donyādîde ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دنیادیدە؛ دنیادیتوو؛ دنیادیە؛ چاوکراوە؛ گەڕیدە؛ خاوەن ئەزموون و ئاگاداری بە هۆی بەساڵاچوویی.

دنیوی / donyavî/: [عربی] *صفت.* دنیایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە دنیاوە.

دو¹ / do/: *اسم.* ١. دوو؛ دوێ؛ ژمارەی سەرەکی گەورەتر لە یەک و چکۆلەتر لە سێ ٢. [ایتالیایی] *[موسیقی]* دۆ؛ هەوەڵین نوتی مووسیقا لە گامی دیاتینیکدا.

دو²: *صفت.* دوو؛ دوێ: ١. یەکێ زۆرتر لە یەک دانە ‹دو مرد؛ دو کتاب: دوو پیاو؛ دوو کتێب› ٢. دووهەم؛ دووەم ‹شمارەی دو: ژمارەی دوو›.

▣ دوبه دو ☜ **دوبدو**

دو جان در یک قالب: *[مجازی]* گیانێک و دوو جەستە؛ زۆر گەرم و لێک نێزیک.

▣ دو پا داشتن و دو پا هم قرض کردن: *[مجازی]* لاق/ قولی لێ بوون بە چوار؛ عابا لێ بوون بە بای؛ تێ‌تەقان؛ تێ‌تەقاندن؛ کلک لە سەر شان دانان؛ بە هەڵەداوان هەڵاتن؛ بۆی دەرچوون؛ خۆ ڕاپسکان؛ خۆ ڕاپسکاندن ‹دو پا داشت و دو پا هم قرض کرد و جیم شد: لاقی لێ بوون بە چوار و بۆی دەرچوو›.

دو چشم داشتن و دو چشم هم قرض کردن: *[مجازی]* چوار چاو ورد بوونەوە؛ چاو بوون بە چوار؛ ڕوانین بە سەرنج و وردیەوە.

دو دوزه بازی کردن: *[مجازی]* سەگی دوولاوەڕ بوون؛ لە سەرەوە هەی کردن و لە ژێرەوە دەی کردن؛ دوولاخۆری کردن؛ لە هەر دوو لا خواردن؛ لەگەڵ هەر دوو لای مامەڵە یان شەڕ بوونە هاودەست و هەر دوولایش فریودان ‹برخی از نمایندگان دو دوزه بازی می‌کردند: بڕێک لە نوێنەران سەگی دوولاوەڕ بوون›.

دو قورت و نیمش باقی بودن: *[مجازی]* داوای باقیەکەیشی کردن دوو ئەونەشی باقی بوون؛ شتی زیایی داوا کردن و بە ناڕەوا خۆ بە خاوەن بەش زانین.

دو-³: *پیشوازه.* دوو- ؛ دوە- ؛ خاوەنی دوو دانە لە شتێ ‹دوکاره؛ دوتیغه: دووکارە؛ دووتێخە›.

دو / dow, do: /: *اسم.* ١. هەڕا؛ ڕا؛ غار؛ خار؛

خار-خار؛ ڕەمەڕەمالێ؛ بەز؛ دەو؛ دوو؛ هەلینگ؛ کار یان ڕەوتی ڕاکردن؛ شەقاندن؛ غاردان؛ قاچان ‹مسابقەی دو: کێبەرکێی هەرا› ۲. *[گفتاری]* فشە؛ بافشە؛ هەڕەشەی بێبن و ڕەمەکی ‹بی‌خود دو نیا، ما گوشمان از این حرفها پر است: بێ هۆ فشە مەکە، زۆرمان لەمانە بیستووە› ۳. چەل؛ چەلە؛ سەرە؛ سەری؛ گیوە؛ باو؛ نۆرە لە کایەدا.

▣ **دو ماراتُن:** دەوی ماراتون؛ کێبەرکێی ڕاکردن بە مەودای ٤۲۱۹٥ میتر.

**دو و میدانی** ☜ **دوومیدانی**

▣ **دو آمـدن:** فشەکردن؛ بافشەکردن؛ هەڕەشەی بن‌شڕکردن.

**دو بە دست کسی افتادن:** هەل کەوتنە دەستی کەسێکەوە؛ دەرفەتی کارێک (زورتر ناڕەوا) بۆ کەسێ ڕەخسان ‹چه خبر است؟ دو بە دست افتاده: چیە؟ هەل کەوتووەتە دەستت›.

**دوآتشه** / doātaše/: *صفت.* ۱. دووکوڵ؛ دوو جار کوڵاو یان لە بەر ئاور بووگ ۲. دووئاتەشە؛ دووڵابرژاو ‹نان دوآتشه: نانی دووئاتەشە› ۳. *[کنایی]* توند و تیژ؛ تون و تیژ؛ ڕەشە ‹وطن‌پرست دوآتشه: نیشتمان‌پەرستی توند و تیژ›.

**دوآلیست** / dû'ālîst، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* دووپەرست؛ دوانەپەرست؛ بڕوادار بە دوانەپەرستی.

**دوآلیسم** / dû'ālîsm/: [فرانسوی]/*اسم.* دووپەرستی؛ دوانەپەرستی؛ بڕوا بە هەبوونی دوو ئافرێنەر لە جیهاندا.

**دوا** / davā، ـها/: [عربی]/*اسم.* دەرمان؛ دەوا: ۱. ـجات؛ ادویە/ داروو ‹دکتر چند قلم دوا نوشت: دوکتور چەن جۆر دەوای نووسی› ۲. *[مجازی]* عیلاج ‹درد من دوا ندارد: دەردم بێ‌دەرمانە› ۳. ماکی کیمیاوی، بەتایبەت ماکی سەر بە شیمی پیشەسازی.

**دواب** / davāb(b)/: [عربی]/*اسم.* *[ادبی]* چاروایان؛ یەکسمان؛ چوارپێیانی بارکێش.

**دوات** / davāt، ـها/: [عربی]/*اسم.* هورنیگ؛ دەوات؛ دەواتە؛ دوێت؛ دەوێت؛ دڤیت؛ حۆقە؛ مەرەکەبدان؛ مەرکەفدان؛ قوتووی مەرەکەب بۆ قەڵەم تێکردن و نووسین.

**دواتگر** / davātgar، ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* چێکەری بڕێ لە دەفرگەلی کانزایی وەک سەماوەر و سینی.

**دواجات** / davācāt/: [عربی] جمعِ ☜ **دوا**

**دواخانه** / davāxāne، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* *[گفتاری]* دەواخانە؛ دەرمانخانە؛ ئەجزاخانە؛ دارووخانە؛ دوکانی دەوا و دەرمان.

**دواخانه‌چی** / davāxānečî، ـها/: [عربی/ فارسی/ ترکی]/*اسم.* *[گفتاری]* دەواخانەدار؛ ئەجزاچی؛ خاوەنی دەواخانە.

**دوا ـ درمان** / davādarmān، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* *[گفتاری]* داودەرمان؛ دەوا و دەرمان؛ دەوا؛ کار یان ڕەوتی چارەسەرکردنی نەخۆشین ‹چرا دوا ـ درمان نمی‌کنی؟: بۆچی داو و دەرمان ناکەی؟›.

**دوار** / davār/: [عربی]/*اسم.* *[ادبی]* خول؛ سووڕ؛ چەرخ؛ چەرخان؛ زڤر.

▣ **دوار سر:** سەرگێژە؛ سەرگێجە.

**دوّار** / davvār/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* گەڕۆک؛ بە هەڵسووڕانەوە؛ سووڕێنەر؛ لە سووڕ؛ خول‌خۆر؛ لە خول؛ بە خول؛ بەگەڕ؛ گەڕندە ‹چرخ دوّار: چەرخی گەڕۆک›.

**دوازده**[1] / davāzdah/: *اسم.* دوازدە؛ دوانزە؛ ژمارەی سەرەکی نێوان یازدە و سێزدە.

**دوازده**[2]: *صفت.* دوازدە؛ دوانزە: ۱. یەکێ زۆرتر لە یازدە دانە ۲. دوازدەهەم؛ دوانزەهەم.

**دوازده‌امامی** / davāzdah'emāmî، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[شیعه]* دوازدە ئیمامی؛ دوانزە ئیمامی؛ بڕوامەند بە ئیمامەتی عەلی کوڕی ئەبیتالب و یازدە کەس لە کوڕ و کوڕەزاکانی.

**دوازدهم** / davāzdahom/: *صفت.* دوازدەهەم؛

دوازدەمـــین؛ دوازدەهـــەمین؛ دوانـــزەمین؛ دوانزەهەم؛ دوانزەهەمین؛ بە پلە و پایە، ڕزن یان جێگای دوازدەهەمیەوە.

**دوازدهمـی** / davāzdahomî ، ـهـا/: ضـمیر. دوازدەهەمی؛ دوانزەیەمی؛ ئەوەی کە لـە پلـەی دوازدەهەمدایە.

**دوازدهمـــین** / davāzdahomîn/: صــفت. دوازدەهەمین؛ دوانزەیـەمین؛ بـە پلـە و پایـەی دوازدەهەمەوە.

**دوازدهـــه** / davāzdahe/: اسـم. دوانزەڵـــە؛ دوازدەیینـــە؛ دوازدەگـــرێ؛ هەوەڵـــین بەشـــی ڕیخۆڵەی چکۆلە لە گوانداراندا.

**دوافروش** / davāfurûš ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] اسم. [گفتاری] دەوافرۆش؛ ئەجزاچی؛ کەسـێ کـە کاری کڕین و فرۆشتنی دەوایە.

**دوال** / davāl/: اسم. سیرم؛ سـیرمە؛ سـریمە؛ ترسمە؛ دواڵ؛ دوالە؛ دوێڵ؛ زوێڵ؛ زۆلە؛ زۆلاک؛ زۆڵ؛ سیپ؛ قایش؛ نەواری لە چەرم.

**دوالپـا** / davālpā/: اسـم. [فرهنـگ مـردم] دۆڵـپا؛ بوونـەوەرێکی خەیاڵـی کـە دەڵـێن دوو پـایێ درێژی وەک دەواڵی هەیـە و ئەگـەر لـە دۆڵ و دەشـــتدا کەســێک بــە تــەنیایی ببینێتــەوە، پـا دەخاتە دەوری ملی و سـواری دەبـێ و بـە زۆر دەیگەڕێنێ.

**دوام**/ davām/: [عربی]اسم. دەوام: ١. خۆڕاگری؛ توانایی بەرەنگار بوونەوە لـە بەرانبـەر تـەوەرە و هۆکاری زیاندەر و لـەنێوبـەرەوە ‹دوام این پارچه خوب بود: دەوامی ئەم پارچەیە باشە› ٢. پایـەداری؛ سـەقام؛ خـــۆڕاگری ‹دوام آوردن: دەوام هێنـــان› ٣. درێـــژە؛ بـــەردەوامی؛ پاشـمـــاوە ‹دوام داشـتن: بەردەوام بوون›.

⊡ **دوام آوردن**: هەڵـــکردن؛ بەرگـــەگرتن؛ بـــڕ کردن؛ دەربردن؛ وەرگەگێرتەی ‹او بـود کـه در برابر این همه سختی دوام آورد: هـەر ئـەو بـوو لـە بەرانبەر ئەو هەموو دژواریەوە هەڵیکرد›.

**دوام داشتن**: ١. خۆڕاگر بوون؛ بە دەوام بوون؛ بە گـورخ بـوون ٢. [قـدیمی] درێـژەدار بـوون؛ بەردەوام بوون.

**دوان** / davān/: قید. [ادبی] بە غـار؛ هەڵـەداوان؛ بـە هـەڕا؛ بـە ڕاکـردن؛ بـە دەرچوونـەوە؛ بـە ڕەمەڕەماڵێ.

**دواندن** / davāndan/: مصدر. متعدی. // **دوانـدی**: غـارتدا؛ **میدوانـی**: غـار دەدەی؛ **بـدوان**: غـار دە// ١. غاردان؛ غار پێـدان؛ خـاردان؛ غـار پێکـردن؛ تاودان؛ ڕەڤاندن؛ هەلینگ/ لینگ دان؛ لنگاردان؛ لۆغاندن؛ لۆکانـدن؛ ڕەمنـەی؛ ڕەمنـای ‹هـر روز مـدتی اسـب را مـیدوانـد: هـەموو ڕۆژێ ماوەیـەک ئەسپەکەی غار دەدا› ٢. داکوتـان؛ ڕەگـاژۆکردن؛ هەڵبگاردن؛ هەڵـبگێڕاندن؛ بلاوکردنـەوە ‹ریشه دوانـدن: بـن داکوتـان› ✻ **دوانیـدن**. هـەروەها: **دواندنی**

■ صفت فاعلی: **دواننده** (غـاردەر)/ صـفت مفعـولی: **دوانده** (غاردراو)/ مصدر منفی: **ندواندن** (غارنەدان)

**دوان-دوان**/ davāndavān/: قید. بە غار-غاران؛ بە هەڕا- هەڕا؛ بە هەڵەداوان؛ بە خار-خارانی؛ لـە حاڵی ڕا کردندا ‹دوان- دوان بـه سویش رفتم: بـە هەڕا- هەڕا چووم بۆ لای›.

**دوانیدن** / davānîdan/ ☜ **دواندن**

**دواوین** / davāvîn/: [عربی] جمعِ ☜ **دیوان**

**دوایر** / davāyer/: [عربـی] ١. جمـعِ ☜ **دایـره** ٢. جمعِ ☜ **اداره**

**دوئـل** / dû'el ، ـهـا/: [فرانسوی]اسم. دۆئیـل؛ ململانێـی دوو کـەس بـۆ پاراسـتنی شـەرەف و ئابڕوویان ‹پوشکین با یکی دوئـل کـرد و کـشته شـد: پووشکین لەگەڵ یەکێکدا دۆئیلی کرد و کوژرا›.

**دوئیـت** / do'îyyat ، ـهـا/: [فارسـی/ عربـی]اسم. دووبـەرەکی؛ دووبەرەکایـەتی؛ جیـایی ‹از ایـن دوئیت دست بردارید و با هم کار کنید: لەم دووبەرەکیـە دەست هەڵگرن و پێکەوە کار بکەن›.

**دوباره** [1] / dobāre/: صفت. دووباره؛ دوباره؛ دواره؛

دووپاتـە؛ دووپـات؛ دسـەر؛ لـەنوو ‹دیـدار دوبـاره: دیمانەی دووباره›.

**دوباره**[۲]: *قید.* سەرلەنوێ؛ دووبـاره؛ دوواره؛ دواره؛ هێ؛ هی‌دی؛ هەمتی؛ هەمتر؛ هەمتەر؛ هەمـدی؛ هەینا؛ هەونا؛ هاونا؛ هانجی؛ گلانا؛ گلانگینا؛ گـڕ؛ باز؛ واز؛ دسەر؛ لە نوو؛ هەم؛ هەمیس؛ هەمدیس؛ هەمیسا؛ هەمیسان؛ هەمیسانەوە؛ ئـەوە دیـسان؛ دیـسا؛ دیـسان؛ دیـسانەوە؛ دوجـارەکی؛ ژ نـوو: ۱. جارێکی‌تر؛ جارێو تـەر ‹دوباره بگـو ببیـنم چـه گفتی: دووباره بلێ بزانم چیت گوت› ۲. هەمباز بەو شـێوەیە ‹دوبـاره برگـشتم سـر کـار قبلـی: دیـسان گەڕامەوە سەر کارە پێشووەکەم›.

**دوباره‌کاری** / dobārekārî/: *اسم.* دووجارەکاری؛ دووپاتـــەکاری؛ دووبارەکـــاری؛ ڕەوتی دووپاتـــە کردنەوەی بێهۆ یان ناڕەوای کارێک ‹وقتی از کـار یکدیگر خبر نداشته باشـیم، ممکـن اسـت دوبـاره‌کـاری بکنیم: کاتـێ کـە ئاگامـان لـە کـاری یـەکتر نـەبێ، وێدەچی تووشی دووبارەکاری ببین›.

**دوبـــامبی** / dobāmbî/: *قیـــد.* دووچـــەپۆکی؛ دووچەپۆکـــە؛ دوولـــەپی؛ هـــەر وە دەســـەی؛ دوودەسی؛ دوودەسـتی؛ بـە زەربـەی هـەر دوو لـــەپی دەســـت ‹دوبـامبی زد تـوی سـر خـودش: دووچەپۆکی دای بە سەر خۆیدا›.

**دوبدو** / dobedo/: *قید.* دوان‌ـدوان؛ دووبـەدوو؛ دوەدوەی؛ دوەــدوە؛ دوو دانەــدوو دانـە؛ بـە شێوەی دوانەیی و بە دووی یەکدا ‹آنهـا را دوبـدو بچین: دوان‌ـدوان بیانچنە›: **دوبەدو**

**دوبـر** / dobar/: *صـفت.* دووبـەر؛ دوەوەر؛ دوەلا؛ دوو لابەر؛ دوو نەبش.

**دوبعـــدی** / dobo'dî/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت.* دووبـەر؛ دوولایـی (سـەبارەت بـە ڕووپـەر، تـەنیا درێژایی و پانایی).

**دوبـل** / dûbl/: [فرانسـوی] *صفت.* دووبەرامبـەر؛ دووبەرابەر؛ دوو ئەونده؛ دوو ئەونـە؛ دووچەنانـە؛ دووچەندان ‹یکباره درآمـدش دوبـل شـد: یـەکجاری دەسهاتی دووبەرامبەر بۆوە›.

**دوبـــل**[۲]: *قیـــد.* دووبەرابـــەر؛ دووبەرانبـــەر؛ دوەبەرامبەر؛ دوو ئەونده؛ دووچەنانە؛ دووچەندان ‹قیمتش را دوبل حساب کرده: نرخەکـەی دووبەرابـەر حسێب‌کردووە›.

**دوبلاژ** / dûblāj/: [فرانسوی] *اسم.* دووبلاژ؛ کـاری وەرگێـڕان (بـۆ فـیلم و نومـایش) ‹مـدیر دوبـلاژ: بەرپرسی دووبلاژ›.

**دوبلکس** / dûbleks/: [از فرانسوی] ☜ **دوپلکس‌ـ۱**

**دوبلور** / dûblor، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* دووبلـۆر: ۱. کەسێ کە کاری گوتنـەوەی قـسەکانی نێـو فیلم بە زمانێکی جگە لە زمانی هەوەڵ ‹او یکـی از دوبلورهای چیره‌دست و خوش صداست: ئەو یەکێ لە دووبلورە لێزان و خۆش دەنگەکانە› ۲. کەسێ کـە لە دەنگی بە جێی یەک یان چەنـد ئەکتـەر لـە فیلمدا کەڵک وەردەگیرێت.

**دوبلـه**[۱] / dûble/: [فرانـسوی] *صـفت.* دووبلـە؛ بـە پەیڤێ جگە لە زمانی سەرەکی (وەک بۆ فیلم).

▣ دوبلـــه کـــردن: دووبلـــەکردن؛ وەرگێـــڕان؛ گوتنـــەوەی پەیـــڤی فـــیلم بـــە زمـــانێکی‌تـــر. هەروەها: **دوبله شدن**

**دوبلـــه**[۲]: *قیـــد.* دووبەرانبـــەر؛ دووبەرابـــەر؛ دوەبەرامبەر؛ بە شێوازی دوانی یان دووبەرامبەر.

▣ دوبلـه پـارک کـردن: پـاڵ بـە پاڵـی یـەک ڕاگـرتن؛ وەسـتاندنی دوو ماشـێن لـە پـاڵ یەکترەوە.

**دوبه** / dûbe/: [؟] *اسم.* کەڵەک؛ کەرەسـتەیەکی تەختی سەر ئاو بۆ گواستنەوەی بار لە ڕۆخانـەدا کە دەبەسرێتە یەدەککێشەوە.

**دوبـەشـک** / dobešak/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت.* *[گفتاری]* دوودڵ؛ دووشـک؛ دوەشـک؛ دڕدونـگ؛ دڕدۆنگ؛ شکدار؛ دڵ‌دانەمەزراو لەمەڕ دوو شتی ڕێ‌تێچۆوە ‹دوبه‌شک بودم و نمی‌دانستم بهتـر اسـت بروم یان بمانم: دوودڵ بووم و نەمدەزانی باشـتر وایـە بڕۆم یان بمێنمەوە›.

**دوبهمزن** / dobehamzan، ـها/: صفت.[گفتاری] بەزاجکەر؛ نێوان تێکدەر؛ چوکڵەشکێن؛ شۆفار؛ شێوەژنە؛ کوڵەبنە؛ پاکڵ؛ پاکڵە؛ شەیتانی کەر؛ خاوەن خوو یا مەیل بە هەڵگێرساندنی دوژمنی لە نێوان خەڵکیدا ‹من تو را این‌طور دوبهمزن نمی‌دانستم: نەمدەزانی ئاوا بەزاجکەری›.

**دوبهمزنی** / dobehamzanî، ـها/: اسم. بەزاجکەری؛ نێوان‌تێکدەری؛ چوکڵەشکێنی؛ شۆفاری؛ کارەڕەهاتی بەدیهێنانی دوژمنی و دژایەتی لە نێوان خەڵکدا.

**دوبیتی** / dobeytî، ـها/: [فارسی/ عربی]اسم. چوارخشتەکی؛ چوارخشتی؛ چەشنێ شیعر کە باڵگەلی هەوەڵ، دووهەم و چوارەمی هاوپاشڵن و پتر لە سەر کێشی «مەفاعیلون، مەفاعیلون، مەفاعیل»ن (وەک چوارخشتیەکانی بابەتاهیر).

**دوبینی** / dobînî/: اسم.[پزشکی] خێلی؛ خوێلی؛ خوولی؛ خێچیێ؛ چاوخواری؛ چاوشاشی؛ چاڤوڕی؛ چاڤویری.

**دوپایه** / dopāye/: صفت.[گیاه‌شناسی] جووت‌جێگە؛ جووت‌خانە؛ دووخانە؛ بوونی گوڵی نێر و گوڵی مێ هەر یەکە لە سەر ڕووەکێکی جیاواز بە گوڵگەلی مێیینە یان نێرینە لە بتە یان دارگەلی جیاوازدا (وەک داری خورما). بەرانبەر: **یکپایه**

**دوپشته** / dopošte/: قید. دووڕزنە؛ دووڕیزە؛ دووڕزە؛ دوەچین؛ لە دوو ڕیزدا ‹مردم دوپشته ایستاده بودند: خەڵکی دووڕزنە ڕاوەستابوون›.

**دوپلکس** / dûpleks/: [از فرانسوی] صفت. ۱. دووقات؛ بە دیوگەلێک لە دوو قاتدا بە پلیکانەی ناوخۆوە: **دوبلکس** [گفتاری] ۲. دوونهۆم؛ بە دوو جێگای جیاوازەوە لە دەسگایەکدا کە دەکرێ لە هەر دووی بە جیاواز کەلک وەربگیردرێت ۳. بە توانایی هەناردنی دوو پەیامی هاوکات بۆ دوو لا.

**دوپوشه** / dopûše/: صفت.[معماری] دووپۆشە؛ دوولۆ؛ بە دوو لای پۆشەنی جیا لە یەکترەوە ‹دیوار دوپوشه: دیواری دووپۆشە›.

**دوپهلو** / dopahlû/: صفت.[مجازی] بە توێکڵ؛ بە تۆکڵ؛ دووپاڵوو؛ نەریسات؛ دوولایەن؛ بە دوو واتای جیاوازەوە ‹یک جواب دوپهلو داد و نتوانستم منظورش را بفهمم: وەڵامێکی بە توێکڵی دایەوە و نەمتوانی لە مەبەستی تێبگەم›.

**دوپیس** / dopiyes، ـها/: [فرانسوی]اسم. جلوبەرگی ژنانە بە شێوەی کوت و دامێن لە یەک پارچە.

**دوپیکر** / dopeykar/: اسم.[نجوم] جەوزا؛ وێنەیەکی ئاسمانی کە بە شێوەی دوو مرۆی لفەدوانە دیتە بەرچاو: **جوزا**

**دوپینگ** / dopîng/: [انگلیسی]اسم.[ورزش] دوپینگ؛ کارەڕەهاتی کەڵک وەرگرتنی وەرزشکار لە ماکی هێزدەر پێش لە دەسپێکردنی یاری.

**دوتائی** / dotā'î/ ☜ **دوتایی**

**دوتادوتا** / dotādotā/: قید. دوان‌ـ دوان؛ دوو‌ـ دوو؛ دوەـ دوە؛ دوڤردوو؛ دوو دانەـ دوو دانە؛ دوو بە دوو؛ بە شێوەی دوانی ‹دوتادوتا راه افتادید که همین را بپرسید؟: دوان‌ـ دوان هاتوون ئەمە بپرسن؟›.

**دوتار** / dotār، ـها/: اسم. دوتار؛ سازێکی ژێدار بە دوو سیمەوە کە زۆرتر لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئێران و وڵاتانی دراوسێیدا باوە.

**دوتایی**[1] / dotāyî/: صفت. دوانی؛ دوودانەیی؛ بە دوان لە شتێک ‹دسته‌های دوتایی: دەستەگەلی دوانی›: **دوتائی**

**دوتایی**[2]: قید. دوانی؛ دووبەدوو؛ دوەیێ؛ هەر دوو پێکەوە؛ لە لا یان لە پاڵ یەکتریەوە؛ وێڕای یەکەوە ‹دوتایی رفتیم سینما: دوانی چووین بۆ سینەما›: **دوتائی**

**دوترکه** / dotarke/: قید. دووپشتەکی؛ دووپشکە؛ دووپشکەیی؛ دووتەرکە؛ دوەتەرکە؛ بە شێوەی دوو کەسی پشت سەر یەک و وێکڕا لە سەر

ئەسب، دووچەرخە یان موتورەوە سوار بوون ‹یک دوچرخه کرایه می‌کردیم، دوترکه سوارش می‌شدیم: دووچەرخەیەکمان بەکرێ دەگرت و دووپشتەکی سواری دەبووین›.

**دوتریم** / doteryom, dûteryom/: [فرانسوی] /اسم. دۆتریۆم؛ هیدرۆژنی قورس؛ ئیزۆتوپی یەک نوترونی هیدرۆژن.

**دوجانبه** / docānebe/: [فارسی/ عربی] صفت. دوولایەنە؛ پێوەندیدار یان سەر بە دوو لا، دوو کەس یان دوو گرۆوە ‹جاسوس دوجانبه؛ توافق دوجانبه: شۆفاری دوولایەنە؛ پێکهاتنی دوولایەنە›.

**دوجنسی** / docensî ، ـها/: [فارسی/ عربی] /اسم. نێرــ مێ؛ نێرــ ما؛ نێروما: ۱. دووڕەگەزی؛ خاوەن تایبەتمەندیگەلی هەر دوو جنسی نێر و مێ ۲. [روان‌شناسی] خاوەن تایبەتمەندیگەلی کردەوەیی و مێشکی هەر دوو جنسی نێر و مێ
* **دوجنسیّتی**

**دوجنسیتی** / docensîyyatî/: [فارسی/ عربی] ☜ **دوجنسی**

**دوجین** / docîn, ducîn/: [از فرانسوی] /اسم. دەرزن؛ دەرزەن؛ دووجین؛ یەکەی ژماردنی کالا برێتی لە دوازدە دانە.

**دوجینی** / docînî, ducînî/: [از فرانسوی] قید. دەرزنی؛ دووجینی: ۱. بە شێوەی دوازدە دانەیی ‹مدادها را دوجینی خریدیم: قەڵەمەکانمان دەرزنی کڕی› ۲. دەرزنێک؛ هەر دووجین ‹دوجینی چهار صد تومان: دەرزنیکی چوار سەد تمەن›.

**دوچرخه**[1] / dočarxe ، ـها/: اسم. دووچەرخە؛ ئامرازێکی گواستنەوەیی بەبێ موتور، بە دوو چەرخی لە دووی یەک، فەرمان، زین و ڕکێفێ کە بە پا لێدان و چەرخاندنی دەبزوێ.

**دوچرخه**[2]: صفت. دووچەرخە؛ دووچەرخ؛ بە دوو چەرخەوە ‹کالسکه‌ی دوچرخه: کالیسکەی دووچەرخە›.

**دوچرخه‌ساز** / dočarxesāz ، ـها؛ ـان/: اسم. دووچەرخەساز؛ کەسێ کە کاری چاکردنەوەی دووچەرخەیە.

**دوچرخه‌سازی** / dočarxesāzî ، ـها/: اسم. دووچەرخەسازی: ۱. کارخانەیەک کە دووچەرخەی تێدا دروست دەکرێت ۲. کارگەی چاکردنەوەی دووچەرخە ۳. پیشە یان کاری دووچەرخەساز.

**دوخانه** / doxāne/: صفت. دووچاوە؛ دوودیو؛ دووژوور ‹جعبه‌ی دوخانه: جابەی دووچاوە›.

**دوخت** / dûxt ، ـها/: اسم. دروومان؛ دوورمان؛ دوژ: ۱. کار یان ڕەوتی دووران؛ دروون؛ دروین؛ دوورین ‹آموزش برش و دوخت: فێرکاری برین و درووماں› ۲. کێل؛ وراز؛ وارز؛ وراست؛ دۆخ یان چۆنیەتی دوورین ‹خوش دوخت: خۆش کێل›.

**دوختن** / dûxtan/: مصدر. متعدی. // **دوختی:** دووریت؛ **می‌دوزی:** دەدووری؛ **بدوز:** بدووره // دوورین؛ دروون؛ دوورین؛ دادروون؛ دووراندن؛ دووراندن: ۱. کێلدان؛ ورازین؛ وراستەن؛ وراسەی؛ وراستەی؛ تەقەڵ دان؛ پێکەوە لکاندنی دوو شتی وەک پارچە بە بەن و سۆژن یان مەکینەی درووماں ‹لحاف دوختن: لێف دوورین› ۲. دالکاندن؛ دالکانن؛ ئەرەلکنەی؛ شتێک بە بەن و دەرزی بە ماکێکی دەقخۆرەوە لکاندن ‹دگمه دوختن: پشکۆژ دالکاندن› ۳. [مجازی] برین/ تێبرین (بۆ چاو)؛ کل نەکردن (بۆ چاو)؛ شتێک لە شوێنێکدا جێگیرکردن ‹چشم به چیزی دوختن: چاو برینە شتێ›. هەروەها: **دوختنی**

■ صفت فاعلی: **دوزنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **دوخته** (دووراو)/ مصدر منفی: **نَدوختن** (نەدوورین)

**دوخت‌ودوز** / dûxt-o-dûz/: اسم. [گفتاری] درووماں؛ وراز؛ وراست؛ خەیاتی ‹کار دوخت و دوز به عهده‌ی دختر بزرگتر است: کاری درووماں لە ئەستۆی کچە گەورەکەیە›.

**دوخته** / dûxte ، ـها/: صفت. دووراو؛ دووریاو؛

دووریاگ؛ ورازیا؛ دروست‌کراو لە دروومان ‹لباس دوخته: گنجی دووراو›.

**دوختەفرۆشی** / dûxtefurûšî ، ـها/: اسم. جل‌وبەرگ‌فرۆشی؛ گنج‌فرۆشی؛ جێگای جل‌وبەرگ فرۆشتن. هەروەها: **دوختەفروش**

**دوخوابە** / doxābe ، ـها/: صفت. دووخەوە؛ بە دوو ژووری تایبەت بۆ خەو ‹یک آپارتمان دوخوابە بە فروش می‌رسد: وارخانێکی دووخەوە بۆ فرۆشە›.

**دود** / dûd/: اسم. دووکەڵ؛ دوکێل؛ دووکێل؛ دوکەڵە؛ دویکێل؛ دوود؛ دوو؛ دوی؛ دومان؛ دوومان؛ سیاتگ؛ کادو؛ کادوو؛ کادی؛ مۆران: ١. گازێک کە لە سووتانی ماکی کەربوندارەوە بەدی دێ و بە بۆنەی تێکەڵ بوونی تۆزی خەڵووز لە گەڵیدا بە چاو دەبینرێت ٢. ماکێک کە بە شێوەی گاز ببینرێت، بەتایبەت تووتن و دەسهاتەکانی ‹شما اهل دود نیستید؟: ئێوە دووکەڵ ناکەن؟›.

▣ **دود از کلەی کسی بلند شدن:** [مجازی] تەم بەر چاوی کەسێک‌گرتن؛ بەر چاو کەسێ تەم داگرتن؛ زۆر توورە بوون، خەم داگرتن یان واق ورمان ‹وقتی این را گفت دود از کلەام بلند شد: کە ئەوەی گوت تەم بەر چاوی گرتم›.

**دود از کندە بلند شدن:** [کنایی] دووکەڵ لە ئاور بوونەوە؛ باز لە سەر داری پیر نیشتن؛ کار لە دەستی کەسی چاوکراوە و بە ساڵاچوو دەرهاتن.

**دود چراغ خوردن:** [کنایی] شەونخوونی کێشان؛ پێشە شکانن؛ شەوانی زۆر نەخەوتن و موتاڵا کردن ‹برای نویسندە شدن باید دود چراغ خورد: بۆ بوونە نووسەر ئەبێ شەونخوونی بکیشی›.

**دود چیزی بە چشم کسی رفتن:** [کنایی] دووکەڵی شتێ چوونە چاوی کەسێکەوە؛ پای کەسێک گرتنەوە؛ گەزەن و تاوانی شتێک بە کەسێ گەیشتن ‹این کارها را می‌کنی آخر دود آن بە چشم خودت می‌رود: ئەم کارانە دەکەی ئاخری دووکەڵەکەی ئەچێتە چاوی خۆت›.

**دود خوردن:** دووکەڵ خواردن؛ دووکەڵ هەڵمژین ‹توی این شهر صبح تا شب دود می‌خوریم: لەم شارەدا ڕۆژ تا شەو دووکەڵ دەخۆین›.

**دود دادن:** دووکەڵ دان؛ قانگ دان؛ لە بەر دووکەڵدا دانان ‹ماهیها را برای نگهداری دود می‌دهند: ماسیەکان بۆ هەڵگرتن دووکەڵ دەدەن›.

**دود زدن:** دووکەڵ لێدان؛ دووکەڵاژۆ بوون؛ کەوتنە بەر دووکەڵ یان لە دووکەڵ زیان و تەگەرە پێگەیشتن ‹دود زدە همەی دیوارها را سیاه کردە: دووکەڵ لێی‌داوە هەموو دیوارەکانی ڕەش کردۆتەوە›.

**دود شدن:** [مجازی] بوونە دووکەڵ؛ بوونە تۆز؛ سووتان و فەوتان ‹هر چە داشت دود شد و بە هوا رفت: هەر چیەکی هەبوو بووە تۆز و بە دەم باوە چوو›.

**دود کردن:** دووکەڵ‌کردن؛ دووکەڵ کەردەی: ١. بە بۆنەی باش نەسووتانەوە، گازێکی ڕەش یان تۆخ لە ئاگر بەرز بوونەوە ٢. [کنایی] کێشانی جگەرە یان ماکی خاوکەر: **دود کشیدن**

**دود کشیدن** ☜ **دود کردن ـ٢**

**دود گرفتن:** دووکەڵ داگرتن؛ دووکەڵ داوەستان؛ دووکەڵ هەڵگرتن؛ دووکەڵ گیرتەیرە ‹همە جا را دود گرفتە بود: هەموو جێگایەک دووکەڵ دایگرتبوو›.

**دودآلود** / dûdālûd/: صفت. دووکەڵاوی؛ دووکەڵین؛ دووکەڵی؛ دوکێلی؛ تێکەڵ بە دووکەڵ ‹هوای دودآلود: هەوای دووکەڵاوی›.

**دودانگیز** / dûdangîz/: صفت. [نامتداول] دووکەڵکەر.

**دودره** / dodare/: صفت. [گفتاری] دوودرگا؛ دوودریا؛ دوو دەرکە؛ دوەبەرە؛ بە دوو درگاوە.

⊡ **دودره کـردن**:*[مجازی]* ۱. دێـر هـاتن و زوو دەرپـەڕین؛ زووتـر لـە کـاتی دیـاریکراو و بـە دزیـەوە دەرچـوون ۲. هەڵـمەقووتکـردن؛ هەڵخستن؛ قاپاندن؛ قووت دان؛ شـتێ بـەبێ ئاگای خاوەنەکەی هەڵگرتن و بردن ‹پولهـا را دودره کرد: پارەکانی هەڵمەقووتکرد›.

**دودزا** / dûdzā ، ـهـا/: *صفت.* دووکەڵـکەر؛ بـە تایبەتمەنـدی دووکـەڵکـردن ‹وسیلـەی نقلیـەی دودزا: کەرەسەی گواستنەوەیی دووکەڵکەر›.

**دودزده** / dûdzade ، ـهـا/: *صفت.* دووکـەلاوی؛ دووکەلاژۆ؛ دووکەڵی؛ دووکەڵین؛ دووکەڵ لێداو؛ وەبەر دووکەڵ کەوتوو ‹با سر و صورت دودزده وارد شد: بە چڕ و چاوی دووکەلاویەوە هاتە ناوەوە›.

**دودستگی** / dodastegî ، ـها/: *اسم.* دووبـەرەکی؛ دوودەستەیی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی دوو دەسـتە بوونی کەسان لە گرۆیەکدا بە بۆنەی دژبڕوایی و بەدیهاتنی دوژمنایەتی لە نێوانیاندا ‹خیلـی زود در انجمن دودستگی پیدا شد و اعضا به جان هم افتادند: زۆر زوو لـە نێـو ئەنجومەنـدا دووبـەرەکی داکـەوت و ئەندامەکان کەوتنە گیانی یەک›.

**دودسـتی** / dodastî/: *قیـد.* ۱. دوودەسـتی؛ دوودەسی؛ بە هەر دوو دەستەوە ‹پول را دودستی تقدیم کرد: پارەکـەی دوودەسـتی پێـشکەش کـرد› ۲.*[مجـازی]* سـفت و سـۆڵ؛ بـە پـێداگریـەوە ‹دودستی بچسب به کارت: سـفت و سـۆل بنـەوە لـە کارەکەت›.

**دودکش** / dûdkeš ، ـهـا/: *اسم.* دووکەڵـکێش؛ ڕۆژینگ؛ لوژن؛ لووجن؛ دوودکێش؛ دووکەڵگیر؛ کەمووترە (بۆ ڕەشماڵ)؛ لوولە یان پلووسـکی لـە کانزا، ئـاجور (یـان شـتیتـر) بـۆ دەربـاز بـوونی دووکـەڵ و گـازیتـر لـە سـۆبە، کوانـوو یـان کوورەوە.

⊡ **دودکـش جـن**:*[زمینشناسی]* کۆڵـەکەیەکی سروشـتی لـە خـاک لـە بنـاری کـەژدا، کـە سەرەکەی بە تاشەبەردێک داپۆشراوە: **گرزدیو**

**دودل** / dodel ، ـهـا/: *صفت.[مجـازی]* دوودڵ؛ دوەدڵ؛ دڕدونگ؛ دڕدۆنگ؛ بـەگومان؛ دڵـخورد؛ سـەددڵ؛ ناخاترجـەم؛ پاـپـا؛ دووشـک لـە هەڵبژاردن نێوان دوو شتدا ‹برای قبول پیشنهادش دودل بودم: بۆ پەزیرانی پێشنیارەکەی دوودڵ بووم›.

**دودلی** / dodelî ، ـها/: *اسم.[گفتاری]* دوودڵـی؛ دڕدونگی؛ دڕدۆنگـی؛ دڵـیـ دڵـی؛ نیگـەرانی؛ ئەرێنـەرێیی؛ ڕاڕایـی ‹دودلی را کنار بگذار و زود تصمیم بگیر: دوودڵی بنە لاوە و زوو بڕیار بدە›.

**دودم** / dodam/: *صفت.* دوودەمە؛ دوەدەمە؛ بـە دوو لێواری تیژەوە (سەبارەت به شیر، تیغ و...).

**دودمـان** / dûdmān ، ـهـا/: *اسم.* ۱. بنەماڵـە؛ بنچینـە؛ بنیچـە؛ ڕەچەڵـەک؛ ڕەتـەوە؛ بنەچـە؛ بنەچەکە؛ بەرەباب؛ لۆن؛ خان و مان؛ خانـەدان؛ بناوان؛ هەموو ئەوانەی بـاب و کاڵـیان یەکێکـە ۲. خێڵ؛ هۆز؛ تیرە.

⊡ **دودمان** کسی را بر باد دادن:*[مجازی]* سـەر و ماڵی کەسێک تێدا بردن؛ قەرەچۆڵی کەسێک بڕینەوە؛ کەسێک و بنەماڵەکەی قڕ تێخستن.
هەروەها: **دودمان کسی بر باد رفتن**

**دوـدو** /dowdow, do:do/: *اسم.* ڕەشوبـەش؛ ڕەشکەوپێـشکە؛ فڕکەفـڕک؛ ڕمـڵ؛ لـەرزینی ڕەشێنەی چـاو ‹از گرسنگی و خستگی چشمهایم دوـدو مـیزد: لـە شـەکەتی و برسـیەتیدا چـاوم ڕەشکەوپیشکەی دەکرد›.

**دود و دم** / dûd-o-dam/: *اسـم.[کنـایی]* چرەدووکـەڵ؛ شـەڕەدووکەڵ؛ چەقـەچۆمان؛ چڕەچەمان؛ دووکەڵ و هەڵمی بەدیهاتوو لە چز و بز (وەکوو ئامادەکردنی کەباب و قلیان) ‹ببین چـه دود و دمـی راه انداختـه: بڕوانـە چ چرەدووکەڵـێکی ناوەتەوە›.

**دودوزه** / dodûze/ ☜ دودوزه بازی کردن، **دو**[۲]

**دوده** / dûde/: *اسم.* ۱. دیلە؛ دوودە؛ تەن؛ تەنی؛ ڕەشـک؛ دۆرژنـگ؛ دوورنـج؛ ڕەژەن؛ هیـبس؛ هیس؛ سیان؛ قورم؛ ماکێکی ڕەش کە بـە هـۆی

سووتانی شتێ، یان وێڕای سووتانی سووتەمەنی، بە شێوەی وردیلەگەلێک بلاو دەبێتەوە ۲. ـ‌ها/ [ادبی] خێزان؛ بنەماڵە.

**دودی** /dûdî/: صفت. ۱. [مجازی] ـ‌ها/ دووکەڵی؛ دووکەڵکێش؛ قەندەکێش؛ خۆگرتوو بە ماکی خاوکەر ‹من دودی نیستم: من دووکەڵی نیم› ۲. ـ‌ها/ بۆن‌کادوو؛ بۆدووکەڵ؛ دووکەلاژۆ؛ وە بەر دووکەڵ خراو ‹ماهی دودی: ماسی بۆن‌کادوو› ۳. دوودی؛ بە ڕەنگی خۆڵەمێشی تاریکەوە ‹رنگ دودی؛ عینک دودی: ڕەنگی خوڵەمێشی؛ چاویلکەی دوودی›. هەروەها: **دودی‌رنگ** ٤. وەک دووکەڵ ‹حرکت دودی: بزاوی وەک دووکەڵ›.

**دور** /dowr, do:r/: [عربی]/اسم. دەور؛ گێژکە؛ گێچکە: ۱. خول؛ سووڕ؛ چەرخ ‹دور زدن: دەور دانەوە› ۲. هاویدۆڕ؛ هاویردۆڕ؛ هاوێر؛ دەوراندەور؛ دەوروبەر؛ پەڕانپەڕ؛ ئاقار ‹دور حیاط: دەوری حەوشە› ۳. ـ‌ها/ لە دابەشگەلی مێژووی زەوین‌ناسی کە چەندێکیان دەورەیەک بەدی دێنن ٤. چەل؛ سەرە؛ سەری؛ نۆبە؛ نۆرە؛ نۆگە؛ گەڕ؛ جار؛ کەڕەت ‹دور دوم بازی: دەوری دووهەمی کایە› ٥. [مجازی] هەل؛ کات؛ دەرفەت؛ باو ٦. [قدیمی] خول؛ کار یان ڕەوتی گەڕانی جامی بادە لە کۆڕدا ۷. [مجازی، قدیمی] ڕۆزگار؛ ڕۆژگار؛ چەرخ؛ فەلەک ۸. [فلسفه] چۆنیەتی بەندیواری و نیازمەندی دوو شت لە بوونیاندا، بە جۆرێ کە هەر کام ئاکامی ئەوی دیکەیە (وەک مریشک و هێلکە).

◙ **دورتا دور**: دەوراندەور؛ دۆرمادار؛ پەڕانپەڕ؛ ئەم پەڕ و ئەو پەڕ؛ گرد و پەڕ؛ گردای‌گرد؛ هۆرە؛ دەور و بەر.

**دورقطبی** ژوور جەمسەری؛ ژوور هێتمی؛ چۆنیەتی دیار و بەرچاو بوونی هەمیشەیی ئەستێرەیەک لەسەر ئاسۆوە: **پیراقطبی**

◙ **دور برداشتن**: دەور هەلگرتن: ۱. خێرایی گرتن؛ ئامەیوە باڵی ‹موتور دور برداشت: موتورەکە دەوری هەلگرت› ۲. [مجازی] پا هەلگرتن؛ پای زیایی داکێشان ‹چرا این‌قدر دور برمی‌داری، چه خبر است: بۆ وا دەور هەڵدەگری، چیە؟›.

**دور به دست کسی افتادن**: هەل بۆ کەسێک ڕەخسان؛ هەل دەستی کەسێک کەوتن؛ دەرفەتی چالاکی و سەرکەوتن بۆ کەسێک دەست دان.

**دور زدن**: دەور دانەوە؛ دەورەوە دەی ‹میدان را دور زد: دەوری مەیدانەکەی داوە›.

**دور گرداندن**: دەور گێران؛ بە دەوردا گەڕاندن؛ گەڕانن؛ دەور پێ دان؛ گێلنەی؛ بە دەورگەڕاندن ‹جعبه‌ی شیرینی را دور گرداند: قوتووی شیرینیەکەی بە دەوردا گێڕا›.

**از دور خارج شدن**: فت بوون؛ لە چالاکی و کارێکدا لاچوون یان لابران ‹دو نفر از بازیکنان تیم از دور خارج شدند: دوان لە کایەکارانی تیم فت بوون›. هەروەها: **از دور خارج کردن**

**دور** /dowre, do:re/: [عربی] حرف. دەور: ۱. بە دەوری؛ لە دەوری؛ بە دەور؛ لە دەور؛ پەگاڵوو ‹دور میز نشسته بودند: لە دەوری مێزەکە دانیشتبوون› ۲. پەڕانپەڕ ‹دور چیزی گشتن: بە دەوری شتێکدا گەڕان›.

◙ **دور جایی گرداندن**: لە جێگایەک گەڕاندن؛ بە دەوری جێگایەکدا گەڕاندن ‹عروس را دور شهر گرداندند: بووکیان بە دەوری شاردا گەڕاند›.

**دور چیزی/ کسی را خط کشیدن**: [کنایی] دەس لە شتێ/ کەسێ هەلگرتن؛ چاو پۆشین لە شتێ یان کەسێک؛ خێری شتێ/ کەسێ بەخشینەوە؛ خێری چتێ/ کەسێک بەشەو کردن ‹دور این پسر را خط بکش: دەست لەم کوڕە هەلگرە›.

**دور چیزی گشتن**: بە دەور شتێکدا خول خواردن/ خولانەوە/ سووڕانەوە: ۱. بە دەوری

شتێکدا گەڕان؛ دەوروو چێوێوەنە گێلەی ‹دور خانه می‌گشت: بە دەور ماڵەکەدا خولی دەخوارد› ۲. *[مجازی]* چوونە دەور و بەری شتێکدا؛ توخنی شتێ کەوتن؛ پەرژانە کارێک؛ لەگەڵ شتێکدا خەریک بوون ‹پدرم می‌گفت: «دور سیاست نگرد»: بابم دەیگوت: «بە دەوری سیاسەتدا مەسووڕەوە»›.

**دور خود چرخیدن:** بە دەور خۆدا خولانەوە: ۱. خول خواردنە دەور خۆدا؛ بە دەوری خۆدا گێچکەکردن؛ دەوروو وێنە چەرخیەی؛ بە خول داجوین؛ لە گەڕ بوون ‹مثل فرفره دور خودش می‌چرخد: وەکوو خولخولە بە دەوری خۆیدا دەخولێتەوە› ۲. *[مجازی]* بە دەور خۆدا خولە هاتن؛ سەرگەردان بوون؛ بەبێ ئامانج و بەرنامە کاری ڕەمەکی کردن ‹صبح تا شب توی این مغازه دور خودمان می‌چرخیم: بەیانی تا شەو لەم دوکانە بە دەوری خۆماندا دەخولێینەوە›.

**دور کسی را گرفتن:** دەوری کەسێ گرتن: ۱. گەمارۆی کەسێک دان؛ خڕ بوونەوە بە دەوری کەسێکدا؛ کۆوە بوون بە دەوری کەسێکدا ‹دور آزاد را گرفته بودند و از او شیرینی می‌خواستند: دەوری ئازادیان گرتبوو داوای شیرینیان لێ دەکرد› ۲. یارمەتی دان و هەواداری لە کەسێک کردن ‹بچه‌ها دور او را گرفتند و نگذاشتند زیاد غصه بخورد: هەواڵان دەوریان گرت و نەیانهێشت زۆر خەفەت بخوا›.

**دور کسی گشتن:** *[مجازی]* لە دەوری کەسێک گەڕان؛ لە بەر کەسێ مردن؛ هاتنە دەور کەسێکا؛ ئامەی دەوروو یۆیەنە؛ قوربان و ساقەی کەسێ بوون ‹الهی دورت بگردم!: یا خوا لە دەورت گەڕێم!›.

**دور هم بودن:** پێکەوە بوون؛ بە دەوری یەکەوە بوون ‹فرداشب بیایید دور هم باشیم: سبەی‌شەو وەرن پێکەوە بین›.

**دور**[1] / dûr /: *صفت.* دوور؛ دویر؛ دیر: ۱. بە مەودای ڕێگایی زۆرەوە ۲. *[مجازی]* جودا؛ جیا؛ جوێ؛ جگا ۳. بە مەودایەکی کاتی زۆرەوە ٤. *[مجازی]* کلا؛ بەرکنار ٥. *[مجازی]* نەگونجاو؛ نەڕەخساو ٦. *[مجازی]* بێ‌خەبەر ۷. *[مجازی]* بێگانە؛ نامۆ.

▣ **دور بودن:** دوور بوون؛ دوور بیەی: ۱. مەودای ڕێگایی زۆر بوون ‹خانه‌مان خیلی دور است: ماڵمان زۆر دوورە› ۲. *[مجازی]* بە دوور بوون؛ جودا بوون؛ جوێ بوون؛ جیا بیەی؛ لێک‌بڕان؛ لێک دابڕان ‹آزاد سه سال از مادرش دور بود: ئازاد سێ ساڵ لە دایکی دوور بوو›.

**دور شدن:** دوور بوونەوە؛ دوور کەفتنەوە؛ دوورەوە بیەی ‹راهمان دور شد: ڕێگەمان دوور بووەوە›.

**دور**[2]: *قید.* دوور: ۱. لە مەودای زۆرەوە ‹دور از خانه: دوور لە ماڵ› ۲. بە شێوەی مەودادار ‹دور کردن: دوورکردنەوە›.

▣ **دور از چشم کسی:** لە دیار نەبوونی کەسێک؛ بە دزی کەسێکەوە؛ بە نهێنی لە کەسێ ‹دور از چشم پدرش سیگار می‌کشید: لە دیار نەبوونی بابی جگەرەی دەکێشا›.

▣ **دور افتادن:** دوورکەوتنەوە؛ دوورەوکەفتن؛ دوورەوەکەوتەی؛ جودا مانەوە؛ هەراڤستش؛ بڕیان؛ دابڕان؛ دابڕیان؛ بڕیەی ‹مدتی است از شهرمان دور افتاده‌ایم: ماوەیەکە لە شارەکەمان دوورکەوتووینەتەوە›.

**دور انداختن:** فڕێ دان؛ فڕە دان؛ فڕە دەی؛ تووڕ دان؛ برک دان؛ پەرت کردن؛ شەمڕاندن؛ ڤەزەلاندن؛ دوورەوە وسەی؛ هەوا داین؛ لە خۆ دوورکردنەوە ‹کفشهای به آن خوبی را دور انداخت: کەوشی بەو باشیەی فڕێ دا›.

**دور ریختن:** فڕە دان؛ فڕێ دان؛ فڕک دان؛ فڕ داین؛ فڕە دەی؛ هەوا داین؛ برنگ دان؛ خستنە دەرەوە؛ تووڕ دان؛ برک دان؛ پەرت کردن؛ تووڕ/ فڕێ دان؛ لە خۆ دوورکردنەوەی

شتان به بۆنەی نەویستنیان ‹این خرت‌وپرتها را دور بریز: ئەم شەخەڵ- مەخەڵانە فڕە بدە›.

**دور ساختن** ☜ **دور کردن**

**دور شدن:** دوور بوونەوە؛ دوور کەوتنەوە/ کەفتنەوە؛ دوور بیەیوە؛ ڕۆیشتن؛ پەڕ بوون ‹از آنجا دور شد: لەوێ دوور بووەوە›.

**دور کردن:** دوورکردنەوە؛ دوور خستنەوە؛ دوور وسەیوە؛ جودا کردنەوە؛ لا بەردەی؛ مەودا پێدان ‹خطر را از خودش دور کرد: مەترسی لە خۆی دوور کردەوە›: **دور ساختن**

**دور ماندن:** دوورکەوتنەوە؛ جیا مانەوە ‹وقتی از همسرش دور ماند، خود را سرگرمِ کار کرد: کاتێ لە هاوسەرەکەی دوور کەوتەوە، خۆی بە کارەوە خەریک کرد›.

**دورآگاهی** / dûrāgāhî/: /اسم. دوورئاگایی؛ تیلیپاتی؛ دووهەشکەری؛ پێوەندی نێوان دوو کەس لە مەودایەکی دوورەوە بە هەست، بیر یان تەنانەت چاو، بە بێ هیچ ئامێرێک.

**دورادور**/ dûrādûr/: قید. دووراودوور؛ دووراندوور: ۱. [نامتداول] لە دوورەوە ‹دورادور دستی تکان داد: دووراودوور دەستێکی ڕاشەکاند› ۲. [مجازی] بە شێوەی ناڕاستەوخۆ ‹او را دورادور می‌شناختم: دووراودوور دەمناسی›.

**دور از جان** / dûr'azcān/: دعا. دوور لە گیان؛ دوور وا؛ دوور بێ لە گیان؛ دوور بای؛ خوا نەکەردە؛ خوا نەخواستە؛ ڕێزوشەیێ کە لە کاتی قسەکردن لە ڕووداوێکی ناخۆشەوە دەگوترێ ‹دور از جان ممکن بود بلایی به سرتان بیاید: دوور لە گیان لەوانە بوو تووشی بەلایەک بێن›.

**دورافتاده** / dûr'oftāde/: صفت. دوورکەوتوو؛ دوورکەوتە؛ دوورکەفتە؛ دوورکەفتگ؛ جێگرتوو لە مەودایەکی دووردا ‹جای دورافتاده؛ دهکدەی دورافتاده: جێگای دوورکەوتوو؛ ئاوایی دوورکەوتە›.

**دوران** / davarān/: [عربی]/اسم. خول؛ سوور؛ چەرخ؛ لر؛ کار یان ڕەوتی خولانەوە؛ سووڕانەوە؛ چەرخیانەوە؛ هەڵسووڕان؛ زڤرین؛ ئەوەخولیەی؛ ئەوەچەرخیەی.

▣ **دوران دادن:** چەرخاندن؛ چەرخ‌دان؛ خول دان؛ خولاندنەوە؛ گەڕاندن؛ سووڕاندن؛ سووڕاندنەوە؛ هەڵسووڕاندن؛ ئەوە خولنەی؛ خولنایوە؛ ئەوە چەرخنەی؛ چەرخنایوە؛ گێلنەی؛ گێلنای؛ هۆرخلنەی.

**دوران کردن:** چەرخان؛ چەرخین؛ خول خواردن؛ سووڕ خواردن؛ لە گەڕ بوون؛ خولانەوە؛ گەڕان؛ سووڕانەوە؛ سووڕان؛ خولیانەوە؛ هەڵسووڕان؛ گردان؛ زڤران؛ چەرخ دان؛ چەرخ خواردن؛ ئەوەخولیەی؛ خولیایوە؛ ئەوەچەرخیەی؛ چەرخیایوە؛ گێلەی؛ گێلای؛ هۆرخلیەی؛ هۆروەخلیەی: **به دوران افتادن**

**به دوران افتادن** ☜ **دوران کردن**

**دوران** / dowrān, do:rān، ـها/: [از عربی]/اسم. ۱. سەردەم؛ چاخ؛ سووڕ؛ ڕۆژگار؛ ڕۆزگار؛ کات و ساتی پێوەندیدار بە دیاردە یان ڕووداوێکەوە ‹در دوران قدیم: لە سەردەمی پێشوودا› ۲. خول؛ گەڕ؛ گەورەترین یەکە بۆ بەشبەندی مێژووی زەوین‌ناسی، برێتی لە چەند دەورە.

▣ **دوران اول:** خولی دێرین ژیواری.

**دوران پارینه‌سنگی:** پالئۆلیتیک؛ خولی کۆن بەردی.

**دوران چهارم:** گەڕی دووهەم لە خولی نوێ ژیواری.

**دوران دوم:** خولی دووهەم؛ خولی نێوان ژیواری.

**دوران سنگ:** عصر حجر ☜ **عصر**

**دوران سوم:** گەڕی هەوەڵ لە خولی نوێ ژیواری.

**دوران نوسنگی:** خولی نوێ‌بەردی؛ سەردەمی بەردینی نوێ.

**دورانداختنی** / dûrandāxtanî/: صفت. بە کەڵک نەهاتوو؛ بە دەرد نەخۆر؛ بێ‌نرخ؛

بێبایەخ؛ بێبایەخی بۆ فڕێدان.

**دوراندیش** / dûrandîš ، ـها؛ ـان/: *صفت*. دووربین؛ دوابین؛ تێبین؛ دوورنوار؛ دوورئەندێش؛ خاوەن توانایی و لێهاتوویی بۆ هەڵسەنگاندنی ئاکام و کاردانەوەی کارگەل لە داهاتوودا ‹آدم دوراندیش فکر فردا را هم می‌کند: مرۆی دوورنوار لە بیری ڕۆژی دواییشدا هەیە›.

**دوراندیشی** / dûrandîšî ، ـها/: *اسم*. دووربینی؛ دوابینی؛ دوورنواڕی؛ دوورئەندێشی: ۱. دۆخی هەبوونی توانایی بۆ هەڵسەنگاندنی ئاکام و شوێنهاتی کار و ڕووداوان ۲. توانایی بەرنامەڕێژی بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ڕووداوگەلی هاتونەهاتدا ۳. کار یا ڕەوتی ڕەچاوکردنی هۆ یان ڕێگایەک بۆ بەرگری لە مەترسی یان گەزنی هاتونەهاتی.

**دوراهی** / dorāhî ، ـها/: *اسم*. دووڕێیان؛ دووڕیان؛ دووڕا؛ جێگایەک کە دوو ڕێگەی لێ جیا دەبنەوە ‹سر دوراهی نگهدار: لە سەر دووڕێیانەکەدا ڕاوەستە›.

**دوربرد** / dûrbord/: *صفت*. دووڕپێو: ۱. بە مەودای زۆرەوە؛ وەها کە تا ڕێگایەکی دوور بڕوا ۲. دوورهاوێژ؛ بە هێزی هاویشتن بۆ مەودایەکی دوور.

**دوربرگردان** / dowrbargardān, do:r- ، ـها/: *اسم*. دیروێن؛ کەوانەڕێ؛ بەشێک لە بوارگە بە شێوەی کەوانەیی کە گەڕانەوەی کەرەستەی ڕاگواستەنی بۆ لایەکی‌تر ئاسان دەکاتەوە.

**دوربین**[1] / dûrbîn ، ـها/: *اسم*. دووربین؛ دیربین: ۱. ئامێرێک بۆ دیتن و گەورە و نزیک‌کردنەوەی دیمەن و شتانی دوور ۲. کامێرا؛ هەر یەکە لەو ئامێرانەی کە وێنەی شتی ڕاستەقانی تۆمار دەکەن ‹دوربین عکاسی؛ دوربین فیلمبرداری: دووربینی وێنەکێشی؛ کامێرای فیلم هەڵگرتن›.

◘ **دوربین زمانی**: دووربینی کاتی؛ دووربینێ کە لە ماوەگەلی دیاریکراودا (وەک سەعاتێ جارێ) بە شێوەی خۆمەش وێنە هەڵدەگرێ.

**دوربین عکاسی**: کامێرا؛ دووربینی وێنەگرتن؛ ئامێرێ بۆ گرتنی وێنە، پتر بە هۆدەکێکی تاریک و ڕۆژنهیەکەوەکە وێنە دەخاتە سەر پەڕەیەکی هەستۆک و تۆماری دەکا.

**دوربین فیلمبرداری**: کامێرا؛ چەشنێ دووربینی وێنە هەڵگرتن کە لە دیمانە بە شێوەی خۆمەش لە سەریەک وێنە هەڵدەگرێ.

**دوربین نجومی**: تلیسکۆپ؛ کەرەستەیەک بۆ ڕوانین لە ئەستێرە و گەڕۆکی ئاسمانان.

**دوربین نقشه‌برداری**: دووربینی نەقشە هەڵگری.

**دوربین نقشه‌کشی**: دووربینی نەقشەکێشان.

◘ **دوربین انداختن**: دووربین خستن؛ دووربین کێشتەی؛ دووربین بەرەو شوێنێ گرتن ‹دوربین انداخت به طرف کشتی و توانست نام کشتی را بخواند: دووربینی بەرەو کەشتیەکە حست و توانی ناوەکەی بخوێنێتەوە›.

**دوربین**[2] /ـها/: *صفت*. دووربین: ۱. دوورنوار؛ دوورئەندێش؛ تێبین؛ دوابین ۲. تووشی نەخۆشی دووربینی چاو.

**دوربینی** / dûrbînî/: *اسم*. دووربینی: ۱. نەخۆشینێک لە چاودا کە نەخۆش دوور بە باشی دەبینێ، بەڵام نزیک جوان نابینێت ۲. دوورنواڕی؛ تێبینی؛ دوابینی؛ کار یان ڕەوتی پێش‌بینی‌کردنی بەرنامەی داهاتوو.

**دورپرواز** / dûrparvāz ، ـان/: *صفت*. دوورەفڕ؛ بە لێهاتوویی و توانایی فڕین تا مەودایەکی دوور.

**دورخیز** / dûrxîz/: *اسم*. هوزم؛ گوژم؛ وزاق؛ هەڵبەز؛ چۆنیەتی خۆکشانەوە بۆ بازدان.

◘ **دورخیز کردن**: وزاق بەستن؛ وزاق دان؛ هوزم بردن؛ هوزمەوە ئاردەی؛ گوژم هێنان؛ لە جێگایەکەوە خۆ بۆ پەڕین ئامادەکردن ‹دورخیز

کرد و خواست از جوی آب بپرد ولی افتاد وسط آب: وزاقی بەست و ویستی لە جۆگەکەوە بپەڕێتەوە بەلام کەوتە نێو ئاوەکەوە〉.

**دوردست** / dûrdast ، ـها/: *صفت.* دوورەدەست؛ دووردەس؛ دوورەدەس؛ دوورترەک؛ هەلکەوتوو دە جێیەکی دووردا.

**دورریختنی** / dûr.rîxtanî/: *صفت.* بەکەلک نەهاتوو؛ بە دەرد نەخۆر؛ پەرت‌کردنی؛ تەوش؛ بێبایەخ؛ بێ‌نرخ؛ مەراش؛ شیاوی فڕەدان.

**دورزن** / dûrzan/: *صفت.* دوورپێک؛ دوورەنگێو؛ بە توانایی پێکان و هاویشتن تا مەودایەکی دوور 〈توپ دورزن: تۆپی دوورپێک〉.

**دوردورها** / dûrdûrhā/: *اسم. [گفتاری]* دووردوورانە؛ دووراندوور؛ جێگای زۆر دوور 〈در آن دوردورها درختی دیده می‌شد: لەو دووردوورانە دارێک بەدی دەکرا〉.

**دورریز** / dûr.rîz ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* پەرتاوتە؛ لێ‌کەفت؛ ئەو شتانە کە لەبەر زایە بوونیان دەیانڕێژن 〈یک کیلو سبزی خریدیم، نصفش دورریز شد: کیلۆیەک سەوزیمان کڕی، نیوەی پەرتاوتە بوو〉.

**دورسخنی** / dûrsoxanî ، ـها/: *اسم.* دوورپەیڤی؛ وت‌وویژی چەن کەس لە مەودای دوورەوە، بە ئامرازگەلی دەنگ و ڕەنگ: **تلەکنفرانس؛ ویدئوکنفرانس**

**دورسنج** / dûrsanc ، ـها/: *اسم.* دوورەپێو: ١. ئامێرێک بۆ ئەندازەگرتنی چەندیەتیەک (وەک دەما، نم یان گوشار و هەناردنی ئاکامی لە دوورەوە) ٢. مەوداپێو * **تلەمتر**

**دورسنجی** / dûrsancî/: *اسم.* دوورەپێوی: ١. زانست و لێهاتوویی ئەندازەگرتنی چەندیەتی لە ڕێگەی دوورەوە ٢. زانیاری و دەیتاگەلێک کە لەو زانستەوە بە دەست هاتووە * **تلەمتری**

**دورگه** / dorage ، ـها/: *صفت.* دوورەگە؛ دووڕە؛ دوڕاجە؛ دراجە: ١. دووڕێژە؛ دووڕهـ ؛ دورە؛ دووڕەک؛ مەلەز؛ دووڕەگ؛ دوەڕەگە؛ دورەک؛ بەدیهاتوو لە دووڕەگەزی لێک جیاواز 〈اسب دورگە: ئەسپی دوورەگە〉 ٢. دووتۆمە؛ دووڕێژە؛ بەدیهاتوو لە تێکەڵی دوو جنسی لێک جیا لە گیادا ٣. دوودانگ؛ بە دوو چۆنیەتی جیاواز لە یەکەوە 〈صدای دورگە: دەنگی دوورەگە〉.

**دورنشینی** / dûrnešînî/: *اسم.* دوورنیشتەیی؛ دوورگری؛ کار یان ڕەوتی نیشتەجێ بوون لە جێگایەک جگە لە جێگەی ژیانی ئاسایی و دەرامەتی خۆ و بەشداری نەکردن لە کار و بەرهەمهێنانی (وەکوو ماڵ، زەوی و زار یان کارخانە). هەروەها: **دورنشین**

**دورنگ** / dorang ، ـها/: *صفت. [مجازی]* دووڕوو؛ دووڕەنگ؛ فێڵباز و درۆزن؛ ناڕاست؛ دهاچە؛ دووڕاز؛ دووزران؛ دووپڵ؛ دوولاژەن.

**دورنگار** / dûrnegār ، ـها/: *اسم.* دوورنووس؛ فاکس: ١. ئامرازێک بۆ هەناردنی نووسراوە، بەڵگە یان وێنە بۆ جێگایەکی‌تر بە هێڵی تەلەفوون ٢. وێنەیێ کە بەم شێوەیە دەسکەوتووە * **دورنویس؛ نمابَر**

**دورنگاری** / dûrnegārî/: *اسم.* کار و ڕەوتی هەناردنی پەیام بە دوورنووس.

**دورنگری** / dûrnegarî ، ـها/: *اسم.* دوورنواڕی؛ دوابینی؛ چۆنیەتی یان توانایی تێ‌گەیشتن یان بەراوردکردنی کاردانەوەی کار یان ڕووداوێک لە داهاتوودا. هەروەها: **دورنگر**

**دورنگی** / dorangî ، ـها/: *اسم. [مجازی]* دوولازەنی؛ دووڕەنگی؛ دووڕوویی؛ دوڕازی؛ ناڕاستی؛ دوولاژەنی؛ درۆزنی و گزیکاری.

**دورنما** / dûrnemā ، ـها/: *اسم.* بەرژەوەند؛ بەرجەوەن؛ دوورنما: ١. بەرچاو؛ دیمەن؛ چاوەنداز؛ وێنەی دیمەنێ لە سروشت ٢. *[مجازی]* دیامان 〈دورنمای این کار خوب است: بەرژەوەندی ئەم کارە باشە〉.

**دورنویس** / dûrnevîs/ ☜ **دورنگار**

**دورو** / dorû/: صفت. دووڕوو: ١. به پشت و بەری وەکوو یەکەوە ‹پارچەی دورو: پارچەی دووڕوو› ٢. بە ڕەنگ و نەخشی دوو لایەنەی پشت و ڕوو ٣. لـها/[مجازی] دووڕاز؛ دووڕوی؛ دهاچه؛ خاوەن ئاکاری ڕیاکارانه ‹آدم دورو: مرۆی دووڕوو›.

**دوروبر** / dowr-o-bar, do:r- ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. دەوروبەر؛ ئاقار؛ هێل؛ هاوێردۆر؛ هەسوولا؛ کەراخبێچاخ؛ قەراخوبیجاخ؛ کەناره و کەنار ‹در آن دور و بر هیچ مغازه نبود: لەو دەوروبەرەدا هیچ دوکانێک نەبوو›.

**دوروتسلسل** / dowr-o-tasalsol, do:r- /: [عربی] اسم. یەک لە دوو یەک؛ ڕەوتی دووپاته بوونەوەی له پەستای زنجیره ڕووداوگەلێ له ماوه و مەوداگەلی وەک یەکدا.

**دور و دراز**/ dûr-o-derāz/: صفت. دوور و درێژ: ١. زۆر درێژ ‹راه دور و دراز: ڕێگەی دوور و درێژ› ٢. [مجازی] تێر و تەسەل؛ تێر و پڕ ‹آرزوهای دور و دراز: ئاواتگەلی دوور و درێژ›.

**دورویه** / dorûye/: صفت. دووڕوو؛ به هەر دوو لای وەک یەکی بەکارهاتۆوه.

**دورویی** / dorûyî ، ـها/: اسم. [مجازی] دووڕوویی؛ دوولاژەنی؛ دووڕەنگی؛ دووڕازی؛ خۆڕێخەری و هاوڕێیی به درۆ بۆ خلەتاندنی خەڵک ‹می‌خواست با چربزبانی و دورویی خودش را دوست ما نشان بدهد: گەرەکی بوو بە زمانلووسی و دووڕوویی خۆی بە دۆستی ئێمه پیشان بدا›.

**دوره** / dowre, do:re ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. /ادوار/ سەردەم؛ چاخ؛ ماوەیەکی دیاریکراو که زنجیره ڕووداوەیەکی تێدا تەواو دەبێ ‹دورەی بلوغ؛ دورەی بیماری: سەردەمی پێگەیشتن؛ چاخی نەخۆشی› ٢. سەردەم؛ چاخ؛ ڕۆژگار؛ ڕۆزگار؛ کاتی سەر به ژیانی کەسێ یان بەدیهاتنی ڕووداوێک ‹دورەی سیاه شاه عباس: سەردەمی ڕەشی شا عەباس› ٣. له بەشبەندیگەلی زەوینناسی چکۆلەتر لە خول و له چەن دەور ٤. زێوار؛ لێواره؛ پەراوێز؛ دەوراندەور؛ قەراخ؛ کەنارەی هەر شتێ بەتایبەت شتی خرت ‹دورەی کلاه: لیوارەی کلاو› ٥. خول؛ قۆناغ؛ دەورەی خوێندن ‹دورەی ابتدایی: خولی سەرەتایی› ٦. دەورەمیوانی؛ چەشنێ میوانی که گرۆیەک له ماوەگەلی دیاریکراودا و هەر جار به میوانداری کەسێک دەیگێڕن ٧. کۆڕ؛ کۆ بوونەوەی کەسانێک له ماوەگەلی کاتی و به ئامانجی دیاریکراوەوه و به شێوەی نافەرمی ‹دورەی قرائت قرآن: کۆڕی خوێندنەوەی قورئان›.

◙ **دورەی احتیاط:** خولی سپێر؛ خولی فێرکاری چەکداری بۆ هێزی یەدەک که ئەرکی سەربازی به جێ هێناوه.

**دورەی آموزشی:** خولی ڕاهێنان؛ خولی فێرکاری؛ خولێ که تێیدا له ماوەیەکی دیاریکراو، به کەسانێکی دیاریکراو، ئامۆژەگەلێکی دیاریکراو دەدرێ.

▣ **دوره افتادن:** [مجازی] سووڕانەوه؛ خول خواردن؛ کەوتنه خول؛ بۆ ئەنجامدانی کارێک بۆ لای کەسانی جۆراوجۆر چوون ‹دوره افتاده بود و برای مجله مشترک جمع می‌کرد: دەسووڕاوه و بۆ گۆڤارەکە، بەشداری خڕ دەکردەوه›.

**دوره ایستادن:** دەورەدان؛ دەورگرتن؛ دەمووره دان؛ به دەور شتێک یان له جێگایەکدا چەمەره دان ‹مردم دوره ایستاده بودند و به حرفهایش گوش می‌دادند: خەڵک دەورەیان دابوو گوێیان لە قسەکانی دەگرت›. هەروەها: **دوره نشستن**

**دورەی چیزی گذشتن:** هەڕەتی شتێ به سەر هاتن؛ جەنگەی شتێ به سەر چوون؛ دەورەی شتێ به سەر چوون/ تەواو بوون/ نەمان؛ باوی شتێک نەمان؛ کاتی برەو و کاردانەوەی شتێ به سەر هاتن ‹دورەی درشکه و کالسکه گذشت: هەڕەتی عارەبانه و کالیسکه به سەر هات›.

دوره داشتن: دەورەمیوانی هەبوون ‹با همکلاسیهای سابقمان دوره داریم: لەگەڵ هاوپۆلیە پێشووەکانماندا دەورەمیوانیمان هەیە›.
دوره دیدن: دەورە دیتن؛ خولێکی فێرکاری دیاریکراو تەواوکردن: **دوره گذراندن**
دوره کردن: ١. دەورکردنەوە؛ دەورەکردنەوە؛ دەورکەردەیوە؛ ئەوەوەنەی؛ خوێندنەوەی دووبارەی وانە بۆ باشتر فێر بوون ‹کتاب شیمی را دو بار دوره کردەام: کتێبی کیمیام دوو جار دەور کردوتەوە› ٢. دەورە دان؛ بە دەور کەسێ/ شتێکەوە کۆ بوونەوە و داگرتنی.
دوره گذراندن ☜ **دوره دیدن**
**دوره‌ای** / dowre'î, do:re'î/: [عربی] *صفت.* دەورەیی: ١. بە شێوەی خولی ‹مهمانی دورەای: میوانی دەورەیی› ٢. بە نۆبە ‹حملەهای دورەای: هێرشی دەورەیی› ٣. نۆبەتی؛ نۆرەیی؛ نۆگەیی؛ خولی ‹بهتر است بحث دورەای باشد و هر کس نظرش را بگوید: باشترە باسەکە نوبەتی بێ و هەر کەس بۆچوونی خۆی بێژێ›.
**دوره‌گرد** / dowregard, do:regard، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. گەڕۆک؛ بازڤان؛ بەبێ جێگای دیاریکراو و هەمیشەیی بۆ کار ‹فروشندەی دورەگرد؛ گدای دورەگرد: فرۆشەری گەرۆک؛ دەرۆزەی بازڤان›.
**دوره‌گردی**/ dowregardî, do:re-، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ١. کار و ڕەوتی خولانەوە؛ سووڕانەوە؛ سەفەر و گەشتی بێئامانج یان بە بێبەرنامەی پێشوو ٢. گەڕۆکی؛ کار یان پیشەی بازڤان.
**دوری**[1] / dowrî, do:rî، ـها/: [عربی]/اسم. دەوری؛ قاپ؛ هیرمان؛ هیربار؛ جۆرێ دەفر بە لێوارەی کورتی هێندێک ڕاستەوە (پێچەوانەی دەوری ئاسایی کە لێوارەی پان و تەختە).
**دوری**[2]: *صفت.* نۆبەتی؛ نۆبەیی؛ نۆرەیی؛ نۆگەیی؛ گەڕی؛ سەری.

**دوری** / dûrî، ـها/: *اسم.* دووری: ١. پلی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دوور بوون ٢. مەودا؛ دۆرینگ؛ نێوان؛ وەرهەنگ ٣. جیایی؛ جودایی ٤. *[مجازی]* دوورەپەرێزی؛ کەنارەگیری؛ خۆلادەری ‹از این جور آدمها دوری کن: لەم جۆرە بنیادەمانە دووری بکە›.
◘ دوری کردن: دووری کردن؛ دوورگرتن؛ دوور بوونەوە؛ خۆ پاراستن؛ پارێزکردن؛ تەکانەوە؛ توخن نەکەوتن؛ دوورەپەرێزی کردن.
**دوریختی** / dorîxtî، ـها/: *اسم.* دووتەحری؛ دووبیچمی؛ دووسەکوتی: ١. *[کانی‌شناسی]* دۆخ یا چۆنیەتی دەرکەوتن بە دوو شێوەی جیاواز (وەکوو کەربوناتی کەلسیوم) ٢. *[گیاه‌شناسی]* دۆخ یان چۆنیەتی دارا بوونی دووجۆر پەرچەم، گەڵا یا گوڵ * **دوشکلی**
**دوز** / doz/: [فرانسوی] ☜ **دُز**
**دوز**[1] / dûz/: [ترکی]/اسم. چووزان؛ ڕێزان؛ سێڕێزکانێ؛ سێڕێزکێن؛ سێچوکڵە؛ دوزوو؛ چەشنێ یاری دوو کەسی لە سەر ڕووپەڕێک کە هەر کەس ١٢ بەرد یان مۆرەی خۆی بە نۆبە (هەر جارێک دانێ) لە سەر جێگایەک دادەنێ و پاشان بە نۆبەت بەردەکان ڕادەگوێزن تا ڕیز بکەون (چووز ببن): **دوزبازی**
ـ **دوز**[2]: *پیواژە.* ـ دوور؛ ـ درووی؛ ـ دوورێن؛ ـ وراز؛ ـ ئەوەوراز؛ بدوور؛ دروومانکار ‹کفشدوز؛ لباسدوز: پێڵاودوور؛ بەرگدروو›.
**دوزاری** / do:zārî/ ☜ **دوهِزاری**
**دوزبازی** / dûzbāzî/: [ترکی/ فارسی] ☜ **دوز**
**دوزخ** / dûzax/: *اسم. [ادبی]* دوژ؛ دۆژ؛ ئارتوون؛ دۆژە؛ دۆژەه ؛ دۆزەخ؛ دووزەخ؛ دۆزەق؛ دووزەق؛ جەهەننەم.
**دوزخی** / dûzaxî، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* دۆژەهی؛ ئارتوونی؛ دۆزەخی؛ جەهەننەمی؛ جەهەندەمی: ١. نیشتەجێی دۆزەخ ٢. *[مجازی]* خراپکار و تاوانبار.

**دوزمانە** / dozamāne ، ـها/: *صفت.* دووزەمانە؛ دووکاتی؛ دووساتی؛ بە کارکرد لە دوو قۆناغی بە شوێن یەکدا ‹موتور دوزمانە: موتوری دووزەمانە›.

**دوزندگی** / dûzandegî/: *اسم.* خەیاتی؛ خیاتی: ١. دروومانی؛ جلدروویی؛ دروومانکاری؛ کاری بەرگدوور ‹دوزندگی می‌کند: خەیاتی دەکات› ٢. *ـها/* دروومانگە؛ کارگای خەیاتی ‹دوزندگی دارد: خەیاتی هەیە› ٣. دروومان؛ کاری دوورین ‹آموزش دوزندگی: هەڤۆتی خەیاتی›.

**دوزنده** / dûzande ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* خەیات؛ بەرگدروو؛ دروومانکار؛ کەسێ کە کاری دروونە (بەتایبەت جلوبەرگ).

**دوزوکلک** / dûz-o-kalak ، ـها/: [ترکی/ فارسی] *اسم. [گفتاری]* فڕ و فێڵ: ١. فاکوفیک؛ فێڵوفەرەج؛ کەڵەک و کلۆک؛ فێڵ و تەڵەکە؛ فەند و فێڵ؛ فەن و فوون؛ گزی؛ هەقە ٢. ڕاو و ڕیو؛ ساز و باز؛ ساخت و پاخت؛ ڕا و ڕێوی؛ پیلان.

▣ **دوز و کلک چیدن/ سوار کردن:** *[مجازی]* پیلان نانەوە؛ فێڵ و فەرەج/ فەتە و فەرەجی کردن؛ پیلان گێڕان؛ ڕاو و ڕیوکردن؛ ساخت و پاختکردن.

**دوزه** / dûze ، ـها/: *اسم.* نووسنەک؛ پرمێشک؛ پەنێرشک؛ دڕکێکی خرتۆکەی دێمەزارە.

**دوزیست** / dozîst ، ـها؛ ـان/: *صفت. [زیست‌شناسی]* دووژینە؛ پێوەندیدار یان سەر بە دوو ژیانەوە: **دوزیستی**

**دوزیستی** / dozîstî/ ☜ **دُوزیست**

**دوسالانه**[1] / dosālāne/: *اسم.* دووسالانە؛ ڕێوڕەسمێ (وەکوو جێژن، کێبەرکێ یان پیشانگا) کە هەر دوو ساڵ جارێک بەڕێوە دەچێ: **بی‌ینال**

**دوسالانه**[2]: *صفت.* دووسالانە؛ دووساڵە؛ پێوەندیدار یان سەر بە دوو ساڵەوە ‹جشن دوسالانه: جێژنی دووسالانە›.

**دوست**[1] / dûst ، ـها؛ ـان/: *اسم.* دۆست؛ دۆس؛ دۆ؛ هەوال؛ ئاوال؛ هەڤال؛ هاولف؛ هەڤڕێ؛ هاوڕێ؛ هەمباز؛ باخوێ؛ دەستەبرا؛ یار؛ هالا؛ برادەر؛ خۆناس؛ هامڕا؛ ڕەفێق؛ ڕەفیق؛ ویست؛ مێر و چێر؛ چێر؛ حەژ؛ حەز؛ کەسێ کە دەیناسن، خۆشیان دەوێ و ڕەحمیان بۆی دەچێ و لێی دڵنیان ‹دوست من آهنگساز است: دۆستەکەم مووسیقارە›.

▣ **دوست صمیمی:** هەڤبەند؛ هەڤالۆشک؛ هەڤالبەند؛ دۆستی گیانی‌ـگیانی؛ هەوالی زۆرنزیک.

▣ **دوست داشتن:** ١. خۆش لێهاتن/ هاتن؛ خۆش ویستن؛ خۆش گەرەک بوون؛ وەشە سیەی/ سیای؛ حەز لێ بوون؛ حەباندن؛ هەباندن؛ لیلاندن؛ بەر دڵ کەوتن ‹این گل را خیلی دوست دارم: ئەم گوڵەم زۆر خوش دەوێ› ٢. پێ خۆش بوون؛ خۆش هاتن؛ ویستن؛ گەرەک بوون/ بیەی؛ حەزکردن؛ حەز کەردەی؛ دڵ لە سەر بوون؛ خوازیار بوون ‹همیشه دوست داشت در بانه زندگی کند: هەمیشە پێی خوش بوو لە بانە بژیت› ٣. خۆش ویستن؛ خۆش گەرەک بوون؛ وەش ئەسیەی/ ئەسیای؛ وەش گەرەک بیەی ‹برادرزاده‌ام را خیلی دوست دارم: برازاکەمم زۆر خوش دەوێ› ٤. خۆش لێهاتن؛ خۆش ویستن؛ وەش ئەسیەی/ ئەسیای؛ ژێ حەزکرن؛ حەز لێکردن؛ ئەویندار بوون ‹آزاد سارا را دوست داشت: ئازاد سارای خوش دەویست› ٥. هەوال بوون؛ دۆست هەبوون؛ ڕەفێق هەبوون؛ دۆس بیەی ‹دوستی داشتم خیلی مهربان بود: دوستێکم هەبوو گەلەک دلۆڤان بوو›.

**دوست شدن:** بوونە دۆست؛ بیەی بە دۆس؛ بوونە هەوال؛ بوونە ڕەفێق؛ گرسانی پێوەندی دلۆڤانی وێڕای پەرمیان و میهرەبانی ‹در دوران دانشگاه با او دوست شد: لە سەردەمی زانستگادا لەگەڵی بوو بە دۆست›. هەروەها: **دوست بودن**

دوست گرفتن: دۆس‌گرتن؛ دۆس پەیدا کردن؛ لەگەڵ کوڕ یان پیاوێک پێوەندی جنسی یان ئەویندارانە دامەزراندن (بۆ کچ یان ژن بە کار دەبرێت) ‹چشمت روشن! باز دخترت دوست گرفته: چاوت ڕۆشن! کچەکەت دیسانەکە دۆسی گرتووە›.

**دوست**[2] / ـها؛ ـان/: *صفت*. دۆست؛ دۆس؛ هۆگر؛ پشتیوان؛ لایەنگر؛ یار؛ خاوەن پەیوەندیەکی دۆستانە ‹کشور دوست: وڵاتی دۆست›.

**ـ دوست**[3]: *پیوازە*. ـ دۆست؛ ـ دۆس؛ ـ یار؛ ـ واز؛ ـ ویست؛ خوازیار ‹آشیانەدوست: هێلانەدۆست›.

**دوستار** / dûstār ، ـان/: *اسم. [ادبی]* خۆشویست؛ هۆگر؛ خوازمەند؛ خوازیار.

**دوستاق** / dûstāq/: [ترکی] ☜ **دُستاق**

**دوستاقبان** / dûstāqbān/: [ترکی/ فارسی] ☜ **دُستاقبان**

**دوستانه**[1] / dûstāne/: *صفت*. دۆستانە؛ دۆسانە؛ وەکوو هەوالان ‹قیافەی دوستانە: تووزی دوستانە›.

**دوستانه**[2]: *قید*. دۆستانە؛ دۆسانە؛ ڕفێقانە؛ نافەرمی؛ بە شێوە و ئاکاری دۆستان. بەرانبەر: **رسمی** ‹پیش آمد و دوستانه سلام کرد: هاتە پێشەوە و دۆستانە سڵاوی کرد›.

**دوستدار** / dûs(t)dār ، ـان/: *اسم*. خۆشویست؛ ئاواتخواز؛ خوازمەند؛ خوازیار؛ حەزکەر؛ ئارەزووکەر؛ هۆگر؛ ئەوی، کەسێ یان شتێکی خۆش دەوێ.

**دوست‌داشتنی** / dûs(t)dāštanî ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* دڵگر؛ ڕەزاسووک؛ زەڕەشیرین؛ ئێسک‌سووک؛ هەستی‌سڤک؛ خۆشەویست؛ خوێن‌شیرین؛ خوێن‌شیرن؛ لە بەردڵان؛ بەردلک ‹بچەی دوست‌داشتنی: منداڵی دلگر›.

**دوستی** / dûstî ، ـها/: *اسم*. دۆستایەتی؛ دۆسایەتی؛ دۆستانی؛ دۆستی؛ دۆسی؛ هەواڵەتی؛ ئاواڵەتی: ۱. ڕێکاتی؛ ڕێکایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هەواڵ بوون ‹دوستی کردن: دۆستایەتی کردن› ۲. ناسیاوی؛ ئاشنایەتی؛ هەبوونی پێوەندی عاتیفی و دڵخواز ‹سالهاست با هم دوستی نزدیکی داریم: چەن ساڵە پێکەوە دۆستایەتی نێزیکمان هەیە› ۳. یاری؛ هاوڕێیی و پشتیوانی ‹شرط دوستی را بە جا آوردن: مەرجی دۆستایەتی بەجێ هێنان›. هەروەها: **دوستی داشتن؛ دوستی کردن**

▣ **دوستی خاله‌خرسه:** *[کنایی]* دۆستی کەسێ کە بە بۆنەی نەزانیەوە دەبێتە هۆی گەزەن و ئازار.

**دوستیابی** / dûstyābî ، ـها/: *اسم*. دۆست‌گری؛ کار یان ڕەوتی دۆزینەوەی ئاواڵ؛ دۆست‌گرتن؛ ڕەفێق‌گرتن ‹آیین دوست‌یابی: شێوەی دۆست‌گری›.

**دوسره**[1] / dosare ، ـها/: *صفت*. دووسەرە؛ دووسەر؛ دووسەرەکی؛ بە کارهاتی هەر دوو لایەنە ‹برای ارومیه بلیط دوسره گرفتیم: بۆ ورمێ بلیتی دووسەرەمان گرت›.

**دوسره**[2]: *قید*. دووسەرە؛ لە هەر دوو سەر/ لاوە.

▣ **دوسره بار کردن:** ۱. دووسەرە بار لێدان؛ لە هەر دوو لاوە بار هەڵگرتن ۲. *[تعریض]* سەگی دوولا وەڕ بوون؛ ڕەفیقی قافلە و شەریکی دز بوون؛ قازانج بردن لە هەر دوو لایەنەوە.

**دوسوتوان** / dosûtavān/: *صفت*. تایبەتمەندی کەسێ کە لە ئەندامەکانی هەر دوو لای لەشی وەک یەک کەڵک وەردەگرێ.

**دوسوتوانی** / dosûtavānî/: *اسم*. توانایی کەڵک وەرگرتن لە هەر دوو لای جەستە بە شێوەی بەرامبەر. بەرانبەر: **سوبرتری**

**دوسیه** / dusiye, do:siye ، ـها/: [فرانسوی] *اسم. [قدیمی]* دۆسیە؛ پەروەندە؛ هەڤنڤیس؛ کۆمەڵێک کاغەز سەبارەت بە کارێ یان کەسێک.

**دوش**[1] / dûš/: *اسم*. ۱. کۆڵ؛ شان؛ دۆش؛ ناوشان؛ قەلاندۆش؛ ناو ملان؛ ناڤقۆڵنج؛ ئەو

بەشە لە لەش کە کەوتۆتە نێوان دەس و مل و سنگ و پشتەوە ٢. /ـھا/ [فرانسوی] دووش؛ چەشنێ شێر، کە ئاو لە سەرەوە بۆ خوارێ دەپژێنێ و لە ژێریدا خۆ دەشۆن ٣. *[ادبی]* دوێشەو؛ دوێنێ‌شەو؛ هێزی‌شەوێ؛ ئێزشەو؛ دوەشەو.

◙ **دوش به دوش** ☜ **دوشادوش**

◘ **دوش گرفتن:** دووش‌گرتن؛ ئاوکردنە خۆدا؛ ئاو ئاسەی وێرە؛ لە ژێر دووشەوە خۆ شۆردن ‹برو دوش بگیر خستگی‌ات در برود: بڕۆ دووش بگرە با ماندوویەتیت دەرچێ›.

**به دوش کشیدن:** بە کۆڵ کێشان: ١. بە شان کێشان؛ لە سەر شانی خۆ بار بردن ٢. *[کنایی]* دژواری و سەختی کێشان.

**روی دوش کسی سوار شدن:** *[کنایی]* هەوساری کەسێک گرتنە دەستەوە؛ سوار ملی کەسێ بوون؛ کەسێک فەرمانبەری خۆکردن.

**ـــ دوش**[2]: *پیواژە.* ـــ دۆش؛ دۆشەر ‹شیردوش: شیردۆش›.

**دوشا** / dûšā/: *صفت.* دۆشەنی؛ دۆشانی؛ دۆشەدەنی؛ دووشا؛ تایبەتمەندی ئاژەڵێ کە شیر بدا ‹گاو دوشا: مانگای دۆشەنی›.

**دوشاب** / dûšāb/: *اسم.* دۆشاب؛ دۆشاو؛ دۆشاڤ؛ دیشاڤ؛ شیلە؛ شۆک؛ ئاوی ترێ یان تووی کولاوی هێندێک خەست.

**دوشاخه**[1] / došāxe، ـھا/: *اسم.* دووشاخە؛ دوولک؛ دوولەق؛ دپەل؛ ئامێرێک لە ماکێکی نارەسانا (پلاستیکی یان کائووچۆ) بۆ گەیاندنی هێزی کارەبا لە پریزەوە بە ئامێرێکی کارەبایی ‹دوشاخەی اُتو را در بیاور: دووشاخەی ئوتووەکە دەربێنە›.

**دوشاخه**[2]: *صفت.* دووشاخە؛ دووپەلان؛ دوولەپان؛ دووفلیقانە؛ دووحاچە؛ دوولق؛ دوولەق؛ دووفاقە؛ دووفاق؛ دووپەل؛ دوویەل؛ دوولک؛ دوولکە ‹یک چوب دوشاخە پیدا کن: چێوێکی دووشاخە بدۆزەوە›.

**دوشادوش** / dûšādûš/: *حرف.* شان‌بەشان؛ گوێ‌بەگوێ: ١. پێکەوە جووت؛ لە لای یەکترەوە ‹دوشادوش یکدیگر راه می‌رفتند: شان‌بەشانی یەکتر دەڕۆیشتن› ٢. بە هاوکاری یان هاوڕێیی یەکتر ‹دوشادوش شوهرش کار می‌کرد: شان‌بەشانی شووەکەی کاری دەکرد› * **دوش به دوش**

**دوشس** / dušes، ـھا/: [فرانسوی] *اسم.* دووشیس؛ سەرناوی ماقووڵانەی؛ هاوسەری دووک لە ئورووپادا.

**دوش‌فنگ** / dûšfang/: *اسم.* *[نظامی]* دووش‌فەنگ؛ دوخێ لە فێرکاری چەکداریدا کە قۆناخی چەک لە سەر لەپی دەست و لوولەکەی لە سەر شانە.

**دوشک** / došak/: [ترکی] ☜ **تُشَک**

**دوشکلی** / došeklî/: [فارسی/عربی] ☜ **دوریختی**

**دوشنبه** / došambe, došanbe، ـھا/: [فارسی/آرامی] *اسم.* دووشەمە؛ دووشەممە؛ دووشەمێ؛ دووشەمب؛ دووشەمبێ؛ ناوی ڕۆژی سێهەمی حەوتە.

**دوشنبه‌شب** / došambešab, došanbe، ـھا/: [فارسی/آرامی/فارسی] *اسم.* شەوی سێ‌شەممە؛ دووشەممەشەو؛ شەوی دووشەممە لە سەر سێ‌شەممە؛ شەوی دوای ڕۆژی دووشەممە.

**دوشیدن** / dûšîdan/: *مصدر متعدی.* // **دوشیدن:** دۆشیت؛ **می‌دوشی:** دەدۆشی؛ **بِدوش:** بدۆشە// دۆشین؛ دۆشان؛ دوشانن؛ دووشین؛ دۆشتەی؛ دۆشەی؛ دۆشای؛ دۆتن: ١. شیر لە گوان دەرهێنان ‹گاو دوشیدن: مانگا دۆشین› ٢. *[مجازی]* دادۆشین؛ لە کەسێک بە فێڵ و فەرەج و زۆر، پارە وەرگرتن ‹هر بار به بهانه‌ای پدرش را می‌دوشید: هەموو جارێک بە بیانوویێکەوە بابی دەدۆشی›. هەروەها: **دوشیدنی**

■ **صفت فاعلی: دوشنده** (دۆشەر)/ **صفت مفعولی:**

**دوشــیده** (دۆشــراو)/ مـصدر منفـی: **نَدوشــیدن** (نەدۆشین)

**دوشیزگی** / dûšîzegî/: *اسم.* کچێنی: ١. کچی؛ کەنیشکی؛ کناچەیی؛ دۆتی؛ دۆخ یان چۆنیـەتی کچ بوون ٢. *[مجازی]* بـن؛ تۆژاڵـێکی ناسـک لـە شەرمی کچدا.

**دوشیزه**[1] / dûšîze، ـها؛ ـگان/: *اسم.* ١. یایـە؛ سەرناوێک بۆ رێزنـان لـە کچـان ٢. کچـێ کـە شووی نەکردووە.

**دوشـیزه**[2]: *صـفت.* کـچ؛ کەنـشک؛ کەنیـشک؛ کەنیک؛ کنا؛ کناچێ؛ کچکا؛ دۆت؛ تایبەتمەندی کچێ کە شووی نـەکردووە ‹هنـوز دوشـیزه اسـت: هێشتا کچە›. هەروەها: **دوشیزه بودن**

**دوغ** / dûq/: *اسم.* دۆ؛ دوو؛ دەو؛ دەویک؛ هالیر؛ ماستاوی لە مەشکەدا ژەنراوی کەرە لێ‌گیراو.

▣ **دوغ بنـگ:** خواردنەوەیـەکی سـرکەرە لـە کولاندنی شادانە دە شیردا ساز دەبێ: **بَنگاب**

▣ **دوغ زدن:** ماسـت ژەنـدن؛ تێکـەڵ‌کـردنی ماست لەگەڵ ئاودا بۆ دروست کردنی دۆ.

**دوغ و دوشاب برای کسی فرق نداشتن/ یکی بودن:** *[مجازی]* کەر و گا لێک جیا نەکردنـەوە؛ هەرە لە برە جیا نەکردنـەوە؛ چـاک و خـراپ لێک نەکردنەوە ‹برایش دوغ و دوشاب فرقی ندارد: کەر و گا لێک جیا ناکاتەوە›.

**دوغـاب** / dûqāb/: *اسـم.* دۆغـاو؛ شـووروارێژ؛ دووغاو؛ دۆغاو؛ تێکەلاوێکی تراوی ئاهەک، گەچ یان سیمان لەگەڵ ئاو کـە لـە بەناییـدا بـە کـار دەبرێ.

**دوغبا** / dûqbā/: *اسم.* دۆکلیو؛ دۆخـەوا؛ دۆخـوا؛ دۆخاوە؛ دانەدوو؛ دەوین؛ مـەهیر؛ مـەیر؛ مـەهر؛ چێشتی دۆ، گیا و دانەوێڵە.

**دوغی**[1] / dûqî/: *اسم.* ١. ـ‌ـها/ دۆ فـرۆش؛ دۆ ورەش ٢. کەوە؛ ڕەنگی سپی بە بنـە ڕەنگێکـی شینەوە.

**دوغی**[2]: *صفت.* کـەوە؛ بـە ڕەنگـی سـپی و بنـە ڕەنگێکی شینەوە.

**دوقلـو** / doqolû، ـهـا/: [ترکـی] *صفت.* هـاولف: ١. دوانە؛ دوانـێ؛ لفەدوانـە؛ لفەودوانـە؛ جووتـە؛ هەواڵ‌دوانە؛ ئاواڵ‌دوانە؛ جێوک؛ جەک؛ جێمک؛ جێڤی؛ جویک؛ جڤی؛ جووی؛ چێمـک؛ جـڤک؛ لڤانە؛ لفـە؛ هەڤـاڵ‌جـەو؛ هەڤـاڵ‌جێـو؛ هەڤـالزا؛ هەڤزک؛ هەمبیزە؛ جومڕانە؛ زگەدوانە؛ جوملانـە؛ بەدیهاتوو بە شێوەی جووت لە سـک و زایەکـدا ‹فرزنـد دوقلـو: منداڵـی لفەدوانـە› ٢. دوولـەقان؛ دوەلەقان؛ بە جووتی هاوتاوە ‹آبشار دوقلو: تـافی هاولف› ٣. دووانـە؛ بـەدیهاتوو بـە شـێوەی دوو لەتی هاوتا یان لکـاو بـە یەکـەوە ‹بـستنی دوقلـو؛ چسب دوقلو: بەستەنی دوانە؛ چەسپی لفەدوانە›.

▣ **دوقلوهای سیامی:** شملی بەرەکـەت؛ شمـلی براکە؛ لفەدوانەی پێکەوە لکاو.

▣ **دوقلو زاییدن:** لفەودوانە هێنان؛ دوانێ بیەی؛ هێنانی دوو زارۆ لە زایینێکدا.

**دوقندی** / doqandî، ـها/: [فارسـی/ معـرب]/ *اسم.* *[شیمی]* دووقەندی؛ تێکەلاوێ کە لە دوو قەنـدی سادەوە پێکهاتووە (وەک ساکاروز و ماڵتوز).

**دوک** / dûk/: *اسم.* ١. تەشـی؛ تـەش؛ لەتـەرە؛ نەتەرە؛ لەتەرێ؛ لۆتـەر؛ دووک؛ دیـک؛ دویـک؛ دووکـەک؛ دووخ؛ خـەرەک؛ جیکنـە؛ چـیکن؛ کلافە؛ ئامرازی ساکاری خرتۆڵە کە بە خولانەوە، خوری یان پەمۆ دەکاتە بەن ٢. ـ‌ـها/ [فرانسوی] دووک؛ ڕێزناوی پیاوانـە لـە ئورووپـادا بـانتر لـە کینت.

▣ **دوک ریــسیدن:** تەشــی ڕێــسین؛ لەتــەرە ڕیسەی؛ بە تەشی بەن بادان.

**دوکاو** / dokāv/: *صفت.* دوولاکووڕ؛ بە هـەر دوو ڕوویەڕی کووڕەوە: **مقعّرالطرفین**

**دوک‌ریــس** / dûkrîs/: *اســم.* تەشــیڕێس؛ لەتەرەڕێسە؛ کەسێ کە بە تەشی، خوری بادەدا.

**دوک‌ریسی** / dûkrîsî/: *اسم.* تەشیڕێسی؛ کـار یان ڕەوتی خەڕەک ڕەستن؛ نەتەرە ڕەستن؛ بـە

تەشی بادانی کولکە.
**دوکفەای / dokafe'î** ، ـھا/: [فارسی/ عربی]/*اسم*. گیانـدار، بەتایبـەت گیانـداری نەرمۆکـە، کـە لپکەیەکی دوو لەتی هەیە.
**دوکوژ / dokûj**/: *صفت*. دوو لاکۆم؛ بە هـەر دوو رووپەڕی کۆمەوە: **محدبّ‌الطرفين**
**دوکـی / dûkî**/: *صفت*. ١. خـەڕەکی؛ وەکـوو تەشـی ٢. *[مجـازی]* مەڕمەووکـە؛ مـەڕەمردوو؛ هـەلووک؛ دارکـەپێچان؛ لەجـەر؛ قاریـت؛ قـاپچووک؛ بزمـۆک؛ لەخـەر؛ لەغـەر؛ چـەگاڵ؛ دالگۆشت؛ زۆر لەڕ و لاواز.
**دوگـانگی / dogānegî** ، ـھـا/: *اسم*. دووبـاری؛ دوانەیی؛ دۆخ یان چۆنیـەتی دوانـە بـوون ‹این دوگانگی توجیه ندارد: ئەم دووباریە قووت ناچێ›.
**دوگانه / dogāne**/: *صفت*. ١. دوانە؛ خـاوەن دوو ئەنـدام یـان دوو هێمـان ‹در مـسابقەهـای دوگانـه شرکت کرد: لە کێبەرکێ دوانەکاندا بەشـداری کـرد› ٢. *[مجازی]* دوو پاڵوو؛ دوولا ‹جواب دوگانه: وەرامی دووپاڵوو›.
**دوگوشـی / dogûšî** ، ـھـا/: *اسم*. هێـدفون؛ ئامێرێک بۆ وەرگرتنی ڕاسـتەوخۆی دەنـگ لـە گوێدا بەبێ بلاو بوونەوە لە جێگایەکی‌تردا.
**دول / doval**/: [عربی] جمعِ ☜ **دولت**
**دول / dûl** ، ـھـا/: *اسم*. *[گفتـاری]* ١. [سـریانی] سەتڵ؛ دۆڵ؛ دولـچە ٢. چـووک؛ چـوو؛ چـوچ؛ کور؛ بلێ؛ ددوولە؛ گونی کوڕی چکۆلە.
**دولا / dol(l)ā**/: *صفت*. دوولا: ١. دووقەد؛ دوولۆ؛ بە دوو ڕووپەڕ یان لۆی پێکەوەلکاو ‹پارچەی دولا: پارچەی دوولا› ٢. *[گفتاری]* کۆم؛ چەماو؛ چـەمیو؛ دووقـەد؛ دانووشـتاو؛ داچـەمیو؛ ئـەرەکۆمیا؛ چەمتاو؛ جقی؛ داهـاتوو؛ خوارەوەبـوو؛ نوشـتاوە؛ شەوین.
◙ **دولا پهنا**: دوولا بەر؛ دوو قەو؛ قوماشێ کە لـە کارخانەدا بە بۆنەی پان بـوونی لـە درێژیـەوە دەقی دەکەن.
◙ **دولا پهنا حساب کـردن**: *[مجـازی]* بـێ‌حەسـاو دانـە بـەر؛ کـێچ بـە گـا کـردن؛ زۆر گـران حەسێب‌کردن ‹پول غذا را دولا پهنا حساب کرد: پارەی چێشتەکە بێ‌حەساو دایە بەری›.
**دولا ـ دولا** راه رفتن: کۆمـەـکـۆم ڕۆیـشتن؛ کۆمەـکۆمە ڕێگە چوون؛ کووڕەـکووڕە ڕۆیین؛ بە نووشتاوی چوونە ڕێ؛ ڕێ چوون بە پـشتی چەماو.
**دولا شـدن**: دانەوینـەوە؛ دانـەوین؛ نـەوین؛ نەمیانـەوە؛ نـەوان؛ کۆمیانـەوە؛ کۆمانـەوە؛ چەمانـەوە؛ چەوتانـەوە؛ چەمینـەوە؛ چـەمان؛ داهاتنەوە؛ داهاتن؛ لار بوونەوە؛ خوار بوونـەوە؛ تا بوون؛ مووچیانەوە؛ ئەرەکۆمیەی؛ کۆمیـایرە؛ ئەرەنامیەی؛ نامیایرە؛ بەرەو خوار لار بوونـەوە؛ نووشتانەوە؛ شکانەوە ‹دولا شد، کیف را برداشـت: دانەویەوە، کیفەکەی هەلگرت›.
**دولا کـردن**: نووشـتاندنەوە: ١. چەماندنـەوە؛ خوارکردنـەوە؛ دانەوانـدن؛ دانـەوانن؛ کۆمـەو کردن؛ ئەرەکۆمنەی؛ ئەرەنامنـەی؛ کۆمنـایرە؛ نامنایرە؛ لارکردنەوە ‹کمرت را دولا کن: ناوقەدت بچەمێنـەوە› ٢. قـەدکردن؛ دوولا کـردن؛ مووچاندنـەوە؛ داموچانـدن؛ تەوانـدن؛ ئەوەنوێرنەی؛ شـکاندنەوە؛ تـاکردن ‹دولا کـن بگذار توی جیبت: قەدی کە بیخە گیرفانت›.
**دولاب / dûlāb** ، ـھـا/: [سـریانی/ فارسـی]/*اسم*. دۆلاو؛ دۆلاب: ١. جەرجـەر؛ جەرجـەرە؛ دول؛ دولک؛ چەرخاو؛ چەرخی ئاو هەلکێشان لە بیر ٢. ناودیواری؛ کەنتۆر؛ کومود؛ کومیدی نێـو دیوار.
**دولابچه / dûlābče** ، ـھا/: [سریانی/ فارسـی]/*اسم*. دۆلاوچە؛ کومیدێکی چکۆلە کە لە نێو دیـوارەوە دروست‌کراوە.
**دولاچنـگ / dolāčang**/: *اسـم*. *[موسـیقی]* دوولاچەنگ؛ یەکەی کات لە نـۆت‌نووسـیدا کـە درێژاییەکەی بەرانبەر بە نیو چەنگە.

**دولبـــه** / dolabe/: *صـفت.* دوودەمـــە؛ دوودەم؛ دووتیغە؛ بە دوو کەنارەی تیژەوە ‹تیغ دولبه: تیغی دوودەمە›.

**دولبی** / dolabî/: *صفت. [زبان‌شناسی]* دوولێـوی؛ لێوی؛ تایبەتمەندی دەنگێ کە بە لێـک‌تـەقیانی دوولێوەوە دەگوترێ، وەک /ب/، /پ/.

**دولپـه** / dolappe ، ـهـا/: *صـفت. [گیـاەشناسـی]* دوولەپەیی؛ جووت لەتکەیی؛ گیای خاوەن تۆمی لفەدوانە (وەک نۆک و بادام).

**دولپه‌ای** / dolappe'î/ ☜ **دولپه**

**دولت** / dowlat, do:lat ، ـهـا/: *اسم.* دەولـەت: ١. /دۆل/ کۆمەڵەی دامـەزراوە و ڕێکخراوەگـەلێ کە بەرنامەڕێژی، سیاسەت دانان و بەڕێوە بردنی کار و باری ولاتێکیان بە دەستەوەیە ‹دولت ماد: دەولەتـی ماد› ٢. تاقمـێ چووکـە لـە کەسـانی ولاتێ کە لە سەردەمێکدا پلە و پایەگی گرینگی بەڕێوەبەرایەتیان بە دەستە و بەرپرسی گێڕان و چاوەدێری کار و باری گشتین ‹دیشب دولت جلسه داشـت: دوێـشەو دەولــەت دانیـشتنیان بــوو› ٣. کۆمەڵەی ڕێبەرایەتی سیاسی ولاتێک ‹دولت حزبی؛ دولت نظـامی: دەولەتـی حیـزبی؛ دەولەتـی چەکداری› ٤. سامان؛ دارایی؛ پووڵ و پارە ‹مال و دولت: ماڵ و دەوڵەت›.

▣ **دولــت ائتلافــی**: دەولــەتی هاوپــەیمان؛ دەولەتێک کە ئەندامانی، نوێنەرانی دوو یـان چەند حیزب یان گرۆی هاوپەیمانن.

**دولت اقلیّت**: دەولەتی کەمایەتی؛ دەولـەتێک کە بە دەستی حیـزبی کەمینـەی سیاسـی و پتــریش بــە هاوپــەیمان بــوون لەگـــەڵ حیزبگەلی‌تردا دروست بووە.

**دولت تـک حزبـی**: دەولـەتی تاقـە حیـزبی؛ دەولـــەتی یـــەک‌پـــارتی؛ دەولـــەتێک کـــە ئەندامـەکانی تـەنیا سـەر بـە حیـزبێکن. هەروەها: **دولت چندحزبی**

**دولــت در تبعیــد**: دەولــەتی لــە تاراوگــە؛ دەولەتێک کە لە دەرەوەی ولات بە دەستی تارێنراوان یان پەنابەران دامەزراوە.

**دولــت مُــستَعجِل**: *[ادبـی]* دەولــەتی ناپایــار؛ دەولەتی گـروپف؛ دەولـەتی تەمـەن کـورت؛ دەولەتێ کە خێرا وەلا نرێ.

**دولت موقت**: دەولەتی کاتی؛ دەولەتێک کـە بە بۆنەی گۆڕانی بار و دۆخی سیاسـی، پـێش لە هەڵبژاردن و دەنگدان دادەنرێ.

**دولت نظامی**: دەولەتی چەکـداری؛ دەولـەتێ کـــە لـــە لایـــەن ســـەرپەلانی ئەرتەشـــەوە دادەمەزرێ.

**از دولت سر کسی**: *[مجـازی]* لـە سـایەی سـەر کەسێکەوە؛ بە بۆنەی کەسێکەوە ‹از دولـت سـر بابابزرگ بچه‌های ده صاحب مدرسه شدند: لە سایەی سـەر باوەگـەورەوە منـداڵانی دێ بوونـە خـاوەن قوتابخانە›.

**دولتخـــواهی** / -dowlatxāhî, do:lat ، ـهـا/: [عربی/ فارسی] *اسم.* دەولـەتخوازی؛ دەولـەتوازی؛ لایەنگری لە دەولەت. هەروەها: **دولتخواه**

**دولتـسرا** / -dowlatsarā, do:lat ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] *اسـم.* دیواخـان؛ تـەلار؛ سـەرناوێک بـۆ خانووی بیسەر یان کەسێکی بەڕێز ‹آمدم دولتسرا تشریف نداشتید: هاتم بـۆ دیواخـان لـەوێ نـەبوون›: **دولت‌منزل**

**دولتمرد** / -dowlatmard, do:lat ، ـان/: [عربـی/ فارسـی] *اسـم.* پلـەداری دەولـەتی؛ لێپرسـراو؛ کەسێک کـە لـە دەولـەتێکدا پایـەی گرنـگ و سەرەکی هەیە.

**دولتمنـد** / -dowlatmand, do:lat ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صـفت.* دەولـەمەند؛ دەولـەمەن؛ دەولـــەتمەن؛ ســـاماندار؛ مایـــەوەر؛ دارا؛ دەسمایەدار.

**دولت‌منزل** / -dowlatmanzel, do:lat/: [عربی] ☜ **دولتسرا**

**دولتی** / dowlatî, do:latî ، ـهـا/: [عربـی] *صفت.*

دەوڵەتی؛ میری؛ سەر بە دەوڵەت ‹کار دولتی: کاری دەوڵەتی›.

**دولتین** / dowlateyn, do:lateyn، ـها/: [عربی] *اسم.* دوو دەوڵەت؛ دەوڵەتان ‹روابط دولتین ایران و عراق: پێوەندی دوو دەوڵەتی ئێران و عیراق›.

**دولچه** / dûlče، ـها/: [سریانی/ فارسی] *اسم.* دۆڵچە؛ سەتڵی چکۆلە.

**دولك** / dolak، ـها/: *اسم.* هەلووک؛ هەلویک؛ پەلیک؛ پلیک؛ چێوێکی چکۆلە کە لە کایەی هەلووکاندا بە دار هەلووک دەیهاوێن.

**دوم** / dovvom/: *صفت.* دووهەم؛ دووەم؛ بە پلە، ڕیز یان جێگای دووەوە.

**دوماً** / dovvoman/: (!) [فارسی/ عربی] *قید.* *[گفتاری]* لە دووهەمدا؛ دووهەم؛ دووەم؛ لە قۆناغی دووهەمدا.

**دوما** / dûmā/: [روسی] *اسم.* دووما؛ کۆڕی قانوون دانانی ڕووسیە.

**دوم‌شخص** / dovvomšaxs/: [فارسی/ عربی] *اسم.* *[دستور]* دووهەم کەس؛ ئەوی کە بیسەرە ‹«تو» ضمیر دوم شخص مفرد است: «تۆ» جێناوی دووهەم کەسی تاکە›.

**دومی** / dovvomî، ـها/: *ضمیر.* دووهەمی؛ دوویەمی؛ ئەوەی کە لە ڕیز، پلە یان جێگەی دووهەمدایە ‹دومی گفت: من نمی‌آیم: دووهەمی گوتی: من نایەم›.

▣ **دومی نداشتن:** بێ هاوتا بوون؛ بێ‌وێنە بوون ‹هنرمندی است که دومی ندارد: هونەرمەندێکە هاوتای نیە›.

**دومین** / dovvomîn/: *صفت.* دووهەمین؛ دووهەم؛ بە پلە و پایە، ڕیز یان جێگای دووهەمەوە ‹دومین نفر از سمت راست: دووهەمین کەس لە لای ڕاستەوە›.

**دومینو** / domîno/: [فرانسوی] *اسم.* دۆمینە؛ دۆمنە: ۱. چەشنێ کایەی سەر مێز کە بە مۆرە دەکرێ ۲. *ـها/* هەر کام لە ۲۸ مۆرەی کایەی دۆمینە کە لە جنسی بەرد، ئێسک یان پلاستیکن و ڕوویەکی کراوە بە دوو بەشەوە و لە هەر بەشدا چەند خاڵی لێ نەخش کراوە.

**دومینیکن** / domînîkan/: [فرانسوی] ☜ **دومینیکی**

**دومینیکی**[1] / domînîkî، ـان/: [فرانسوی] *اسم.* دومینیکی: ۱. ڕێبازی ڕەبەنانی خاچپەرستی کاتولیک کە لە سەدەی ۱۲ی زایینی لە لایەن قدیس سن دومینیکی سپانیاییەوە دامەزرا ۲. هەر کام لە ڕێڕەوانی ئەو ڕێبازە ✱ **دومینیکَن**

**دومینیکی**[2]: *صفت.* دومینیکی؛ پێوەندیدار یان سەر بە دومینیکیەوە: **دومینیکَن**

**دون** / dûn، ـان/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* زەبوون؛ خوار؛ ژێر؛ نزم؛ پەست؛ پەس؛ نەوی؛ پیسکە.

**دون‌اشل** / dûn'ešel/: [عربی/ فرانسوی] *صفت.* پلەخوار؛ پایەنزم؛ ژێردەست؛ چێردەس.

**دونبش** / donabš/: *صفت.* *[ساختمان]* دووبەر؛ دوەوەر؛ دوونەبش ‹سر کوچه‌ی ما یک بقالی دونبش هست: لە سەر کۆڵانی ئێمە بەقاڵیەکی دووبەر هەیە›.

**دونپایه** / dûnpāye/: [عربی/ فارسی] *صفت.* پلەخوار؛ پایەنزم؛ ژێردەست؛ بە پلە و پایەی کەم و گمەوە ‹کارمند دونپایه: کارگێری پلەخوار›.

**دونپرور** / dûnparvar/: [عربی/ فارسی] *صفت.* *[ادبی]* سپلەپەروەر.

**دوندگی** / davandegî، ـها/: *اسم.* هاتوچوو؛ هاتوچۆ؛ ڕەمەڕەماڵێ؛ ڕاوڕاوان؛ ئامشۆ و تێکۆشانی زۆر بۆ ئەملا و لا بۆ ئەنجامدانی کارێک یا گەیشتن بە مەبەستێک ‹کارش شده بود دوندگی توی ادارات: کاری ببووە هاتوچوو لە مەزرینگەکاندا›.

▣ **دوندگی کردن:** هات و چوو کردن؛ کرد و کۆشی هاوڕێ لەگەڵ هاتوچۆی زۆرکردندا.

**دونده** / davande، ـها؛ ـگان/: *اسم.* ڕاکەر؛ کەسێ کە خێرا ڕادەکا ‹دونده‌ی ماراتن: ڕاکەری

ماراتون›.

**دون‌صفت** / dûnsefat ، ـان/: [عربی] *صفت*. زەبوون؛ پەست؛ خوار؛ نەوی؛ خاوەن خۆ و خدەی ناحەز و دوور لە ڕاستی و دروستی.

**دونفرە**[1] / donafare ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت*. دووکەسی؛ دووکەسە؛ تایبەت یان شیاو بۆ دوو کەس.

**دونفرە**[2]: *قید*. دووکەسی؛ دووکەسە؛ هەر دوو کەس پێکەوە ‹دونفره در آن اتاق زندگی می‌کردند: دووکەسی لەو ژوورە دەژیان›: **دونفری**

**دونفری** / donafarî/: [فارسی/ عربی] ☜ **دونفرە**

**دونقطە** / donoqte ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم*. دووخاڵ؛ جووت‌خاڵ؛ نیشانەیەک بەم شێوەیە «:» کە پێش لە ڕاڤەی بابەتێک یان گوتنەوەی قسەیەک دادەنرێ.

**دونگی** / dongî/ ☜ **دانگی**

**دونم** / donam/: *اسم*. *[گفتاری]* تەڕ؛ بە شێ زۆرتر لە نم و کەمتر لە خووساو. هەروەها: **دونم کردن**

**دون‌همت** / dûnhemmat ، ـان/: [عربی] *صفت*. خوێڕی؛ بێ‌بەهرە لە هەڵگ و شەوقی پێویست بۆ کاری گەورە.

**دونین** / devoniyan/: [فرانسوی]/*اسم*. دیڤۆنیەن؛ چوارەمین دەورە لە خولی هەوەڵی زەوین‌ناسی.

**دووقتە** / dovaqte ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت*. دووکاتە؛ دووساتە؛ دوونۆرە: ١. بە دوو نۆرەکاتی کار لە هەر ڕۆژدا (زۆرتر بەر لە نیوەڕۆ و دوای نیوەڕۆ) ‹مدرسەی ما دووقته است: قوتابخانەی ئێمە دووکاتەیە› ٢. بە نۆرەی کاری جیاوازەوە (بە شێوەی بەیانی و دوای نیوەڕۆ یان ڕۆژ و شەو).

**دوومیدانی** / dov-o-meydānî, dov-va-mey-/: [فارسی/ عربی]/*اسم*. ١. کێبەرکێی وەرزشی بریتی لە چەن ڕشتە (وەکوو ڕاکردن و بازدان و هاویشتن و...) ٢. هەر کام لەو ڕشتە وەرزشیانە.

**دوهزاری** / dohezārî ، ـها/: *اسم*. دووقەرانی؛ دووقرانی: **دوزاری** *[گفتاری]*

▣ **دوهزاری کسی کج بودن** ☜ **دوهزاری کسی نیفتادن**

**دوهزاری کسی نیفتادن**: *[مجازی]* کەسێک تێنەگەیشتن؛ لە قسەی بێژەر حاڵی نەبوون ‹هنوز دوهزاری من نیفتاده بود که مقصودش چیست: هێشتا تێنەگەیشتبووم کە مەبەستی چیە›: **دوهزاری کسی کج بودن.** هەروەها: **دوهزاری کسی دیر افتادن**

**دویدن** / davîdan/: *مصدر. لازم.* // **دویدی**: ڕات‌کرد؛ **می‌دوی**: ڕادەکەی؛ **بدو**: ڕاکە// ڕاکردن؛ هەڕاکردن؛ ڕەمەی؛ ڕەمای: ١. هەڵاتن؛ غاردان؛ خاردان؛ بەزین؛ بەزان؛ وەزین؛ دوڤین؛ لنگ دان؛ هەڵین گدان؛ قاچان ‹تا سر کوچه دویدم: تا سەر کۆڵان ڕام‌کرد› ٢. *[مجازی]* دەرچوون؛ فڕین؛ هەڵاتن؛ بەرشیەی؛ هەشتاوکردن ‹بدو دو تا نان بخر: دەرچۆ دوو نان بکڕە› ٣. هات‌وچووکردن ‹از صبح تا حالا برای پیدا کردنش دویده‌ام: لە بەیانیەوە تا ئێستا بۆ دۆزینەوەی ڕام‌کردووە›. هەروەها: **دویدنی**

■ صفت فاعلی: **دونده**: (ڕاکەر)/ صفت مفعولی: **دویده** (ڕاکردوو)/ مصدر منفی: **ندویدن** (ڕا نەکردن)

**دویست**[1] / divîst, devîst/: *اسم*. دووسەد؛ دوەسەد؛ دویست؛ ژمارەی سەرەکی دووبەرامبەری سەد، لە نێوان سەد و نەوەد و نۆ و دووسەد و یەکدا.

**دویست**[2]: *صفت*. دووسەد؛ دویست؛ دوەسەد: ١. یەکێ زۆرتر لە سەد و نەوەد و نۆ دانە ٢. دووسەدەم.

**دویستم** / divîstom, devîstom/: *صفت*. دووسەدەم؛ دویستەم؛ بە پلە و پایە، ڕیز یان جێگای دووسەدەمەوە.

**دویستمی** / divîstomî, devîstomî/: *ضمیر*. دووسەدەمی؛ دویستەمی؛ ئەوەی کە لە پلە، ڕیز یان جێگای دووسەدەمدایە.

**دویستمین** / divîstomîn, devîstomîn /: *صفت.* دووسەدەمین؛ دویستەمین؛ دوەسەدمین؛ بە پلە، ڕیز یان جێگای دووسەدەمەوە.

**دویستی** / divîstî, devîstî ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* دووسەدی؛ دویستی؛ دوەسەدی؛ ئەسکەناسی ۲۰۰ تمەنی (۲۰۰۰ ڕیاڵی) ‹یک دویستی گذاشت کف دستم و رفت: دووسەدیەکی نایە لەپی دەستم و ڕۆیشت›.

**ده**[1] / dah/: *اسم.* دە؛ ژمارەی سەرەکی دوای نۆ و پێش لە یازدە.

**ده**[2]: *صفت.* دە: ۱. یەکێ زۆرتر لە نۆ دانە ‹ده کتاب؛ ده مرد: دە کتێب؛ دە پیاو› ۲. دەیەم؛ دەهەم ‹ردیف ده: ڕزنی دە›.

**ده ـ**[3]: *پیشوازه.* دەـ؛ بە دە دانە ئەندام یان بەشەوە ‹ده طبقه؛ ده نفره: دە نهۆم؛ دەکەسی›.

**ده**[1] / deh ، ـها؛ ـات/: *اسم.* دێ؛ لادێ؛ گوند؛ گون؛ ئاوایی؛ لاگە؛ دەگا؛ لادەگا؛ کەند؛ کۆمەڵێک لە چەند ماڵ و مەزرا لە لای یەکەوە کە لە ۵ تا ۵۰۰ بنەماڵەی تێدا بژین.

▣ **ده اربابی:** دێبەگی؛ دێی ماڵکی؛ گوندی ئاغەواتی؛ دێیەک بە یەک یان چەند خانەوە.

**ده خرده مالکی:** دێی وردەبەگی؛ گوندی وردەماڵکی؛ دێیەک کە هی چەند وردە ماڵکە.

**ــده**[2]: *پیواژه.* ــ دە؛ــ دەر؛ دەهندە ‹شیرده: شیردە›.

**دها** / dahā/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ژیری؛ زیرەکی؛ زرنگی؛ بزێوی؛ وریایی؛ وشیاری؛ چاوماری.

**دهات** / dehāt, dāhāt/: [فارسی/ عربی] جمعِ ☜ **دِه**

**دهات** / dohāt/: [عربی] جمعِ ☜ **داهی**

**دهاتی** / dehātî ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت.* دێهاتی؛ لاگەیی؛ لادێیی؛ دێکانی؛ گوندی؛ دیاتی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە دێ ‹لباس دهاتی: جلوبەرگی دێهاتی› ۲. لە دایک بوو یان گەورە بووی دێ ‹زن دهاتی: ژنی دێهاتی›.

**دهاقین** / dehāqîn/: [عربی] *[نامتداول]* جمعِ ☜ **دهقان**

**دهــان** / dahān ، ـهـا/: *اسم.* دەم؛ دم؛ دەو؛ دەمگە؛ دەڤ: ۱. زار؛ زەهر؛ هوڵۆڵـیەک لە جەستەی گیانداراندا کە لەوێوە خۆراک دەچێتە ناو لەشیان ۲. زار؛ زەهر؛ هلۆلیەک لە جەستەی مۆرغەداراندا کە لە نێوان لێو و گەروودایە و زمان و هاروو و ددان دادەگرێتەوە ۳. زارک؛ دەرگا؛ درگا؛ دەر؛ ڕێگای چوونە ناوەوە لە هەر شتێکدا ٤. ئەندامی قسەکردن ‹یک دهان خواندن: دەمێک خوێندن› ❋ **دَهَن** *[گفتاری]*

▣ **دهان به دهان گذاشتن/ دادن:** *[مجازی]* دەم نانە دەم؛ دەمنەدەمانێ کردن ‹چرا دهان به دهانش می‌گذاری؟: بۆچە ددم نەنیتە دەمی؟›.

**دهان به دهان گشتن:** *[مجازی]* دەماودەم گەڕان؛ دەماودەم چوون؛ دەماودەم کەفتن؛ دەمەودەم گێلەی؛ بە شێوەی هەواڵ بلاوەوە بوون.

**دهان را آب کشیدن:** *[کنایی]* دەم شۆردنەوە؛ دەم سڕین؛ لە قسەی پیس تۆبەکردن ‹این حرفها کفر است، برو دهانت را آب بکش: ئەم قسانە کفرن، بڕۆ دەمت بشورەوە›.

**دهان را شیرین کردن:** دەم شیرین کردن؛ شتێکی شیرن خواردن ‹این خرما خیلی خوشمزه است، دهانتان را شیرین کنید: ئەم خورمایە زۆر خۆشە، دەمتان شیرین کەن›.

**دهان کسی آب افتادن:** *[کنایی]* ئاو زانە دەمی کەسێک؛ زۆر کەوتنە سەر هەوا ‹پولها را که دید دهانش آب افتاد: پارەکانی کە بینی ئاو زایە دەمی›. هەروەها: **دهان کسی را آب انداختن**

**دهان کسی آستر داشتن:** *[مجازی]* دەمی کەسێک بەرگەی خواردنی شتی زۆر گەرم (داخ) گرتن.

**دهان کسی بوی شیر دادن:** *[کنایی]* دەمی

کەسێک بۆی شیر دان؛ بۆی شیر لە دەمی کەسێ هاتن؛ هێشتا لە هێلکە نەجووقان؛ هێشتا منداڵ یان کەم‌تەمەن بوون ‹زن بگیری؟ تو هنوز دهانت بوی شیر می‌دهد: ژن بێنی؟ تۆ هێشتا دەمت بۆی شیر دەدا›.

**دهان کسی چفت و بست نداشتن:**[مجازی] دەمی کەسێک نەوێسان/ لەق/ شڕ بوون؛ زوانی کەسێک نەوەستان؛ دەمی کەسێک بەرەڵا بوون؛ ڕازدار نەبوون.

**دهان کسی را باز کردن:**[کنایی] سەری کەسێک داکێشان؛ کەسێک هێنانە قسەوە؛ قسە لە کەسێ کێشانەوە.

**دهان کسی را بستن:**[کنایی] دەمی کەسێک دادروون؛ دەمکوت کردنی کەسێک؛ بەردەمی کەسێ گرتن؛ دەمی کەسێک بەستن؛ لە قسە کردنی کەسێک بەرگری‌کردن.

**دهان گرم داشتن:**[مجازی] دەم‌پاراو بوون؛ دەم گەرم بوون؛ زار خۆش بوون؛ دەماوەر بیەی؛ قسە خۆش بوون ‹خیلی دهان گرمی داشت و آدم از صحبتهایش سیر نمی‌شد: زۆر دەم‌پاراو بوو، کەس لە قسەی ماندوو نەدەبوو›.

**از دهان افتادن:**[مجازی] ۱. لە باو کەوتن/ کەفتن؛ کوژانەوە؛ چیدی سەبارەت بە بابەتێک قسە نەکران ۲. بوونە دەمی مردگ؛ لەدەم/ خواردن کەوتن؛ سارد و بێ‌تام بوونەوەی چێشت.

**از دهان کسی پریدن:**[مجازی] لە دەمی کەسێ دەرپەڕین؛ لە دەم کەسێ باز بردن؛ لە دەم کەسێ داکەفتن؛ دەمەنە تڕەی؛ بێ‌ویست و لەپڕ قسەکردن ‹از دهانم پرید که دیروز آزاد را دیدم: لە دەمم دەرپەری دوێکە ئازادم دیوە›.

**از دهان کسی قاپیدن:**[مجازی] لە حەواوە گرتنەوە؛ قسەی کەسێک کردنە بەڵگە یان سەرنج پێدان.

**به دهان کسی چشم دوختن:**[کنایی] چاو لە دەمی کەسێ بوون؛ چاو بڕینە دەم کەسێ؛ قسەی کەسێک بە جێ‌هێنان: **به دهان کسی نگاه کردن**

**به دهان کسی مزه کردن:**[کنایی] کەسێک چەشتەخۆرە بوون؛ دڵخوازی کەسێک بوون ‹پیداست که پول مفت به دهان آرام مزه کرده است: دیارە ئارام چەشتەخۆرەی پارەی مفت بووە›.

**به دهان کسی نگاه کردن** ☜ **به دهان کسی چشم دوختن**

**به دهانها افتادن:**[مجازی] کەوتنە سەر زاران؛ بڵاوە بوون؛ بڵاو بوونەوە.

**توی دهان کسی زدن** ☜ **تو**[۲]

**یک دهان خواندن** ☜ **یک**[۲]

**دهان‌بند** / dahānband ، ـها/: اسم. ۱. دمامک؛ دەم‌هەڵپێچ؛ پارچەیەک کە بەر دەمی پێ دادەپۆشن ۲. دەم‌بێن؛ زاربێن؛ زیار؛ لەواشە؛ زاربەست؛ دەم‌بەست؛ دەمبەس؛ دەمبەند؛ دەمووس؛ بزمەک؛ بزمۆک؛ دەڤبێنک؛ زاربێنک؛ ئامرازێک بۆ بەستنی دەمی چوارپێ.

**دهان‌بین** / dahānbîn ، ـها؛ ـان/: صفت.[مجازی] زووباوڕ؛ چاولەدەم؛ دەمبین؛ بە خۆ و خدە و هۆگرەتی بڕواکردن بە قسەی دیتران، بەبێ هەڵسەنگاندنیان ‹شوهرش خیلی دهان‌بین است: شووەکەی زۆر زووباوڕە›: **دهن‌بین**

**دهان‌بینی** / dahānbînî/: اسم.[مجازی] زووباوڕی؛ چاولەدەمی؛ دۆخ یان چۆنیەتی چاولەدەم بوون: **دهن‌بینی**

**دهان پر کن** / dahānporkon/: صفت.[مجازی] پڕتەمتەراق؛ بە ڕواڵەتێکی گرنگ، بەلام بێ‌ناوەرۆک ‹برای شرکت یک اسم دهان‌پرکن پیدا کن: بۆ بەشدارگە، ناوێکی پڕتەمتەراق پەیدا کە›: **دهن‌پرکن**

**دهان‌دره** / dahāndarre ، ـها/: اسم. باوێشک؛ باوشک؛ باوشکێن؛ بارێشک؛ وەلایش؛ دەبانک؛

دەبەنک؛ ئاژاژک؛ ئاژاژگی؛ ئاژئاژە؛ ئاژاشکە؛ وێژە؛ گرکەش؛ قەدجەرە: **دهن‌درّه**

▣ **دهان‌دره کردن:** باوێشک دان؛ بارێشک دان؛ وێژەرە ئاسەی.

**دهان‌دریده** / dahāndarîde/: *صفت. [مجازی]* دەمشڕ؛ دەمپیس؛ دەمچەپەڵ؛ دەمدڕیا؛ دەم بەڕەڵلا؛ جنێوفرۆش؛ جوێن‌فرۆش؛ دوژێن‌فرۆش؛ دژمێن‌دەر؛ دەڤپیس؛ زمانشڕ؛ دەڤچێر؛ دەڤگەنی؛ سخێف‌بێژ؛ زمان‌ڕەش؛ خۆگرتوو بە گوتنی قسەی ناشیرین و جنێودان: **دهن‌دریده**

**دهان‌سوز** / dahānsûz/: *صفت.* داخ؛ سوور؛ زۆر گەرم؛ دەمسووتێن: **دهن‌سوز**

**دهان‌کجی** / dahānkacî، ـها/: *اسم.* ۱. لاسایی؛ دەمەلاسکێ؛ دەمەلاسکە؛ لاسایی؛ لاسای؛ زارزارک؛ کاری گاڵتە پێکردن و لاسایی کردنەوەی قسەی کەسێ ۲. *[مجازی]* کار و ڕەوتی سووک و چرووک کردن؛ سووکایەتی کردن ❊ **دهن‌کجی**

**دهان‌گشاد** / dahāngošād، ـها/: *صفت.* دەمتاک؛ دەمگوشاد؛ دەمهەراو؛ دەمزل؛ بە زاری گەورەوە ‹شیشەی دهان‌گشاد: شووشەی دەمتاک›: **دهن‌گشاد**

**دهانه** / dahāne/: *اسم.* دەم؛ زارک؛ دەرگا؛ درگا؛ دەر؛ دەرقەدامک؛ کونی سەرەوەی شتێکی هلۆل ‹دهانەی غار؛ دهانەی بطری: زارکی ئەشکەوت؛ دەمی بتری›.

▣ **دهانەی آتشفشانی:** زارکی گڕکان؛ چاڵی سەر تروپکی کێوی گڕکان کە دووکەڵ و گازی لێوە دەردێ.

**دهانەی رودخانه:** ئاوڕێژ؛ کیە؛ شوێنی ڕژانە دەریای ڕووبار.

**دهانی** / dahānî/: *صفت.* دەمی؛ زاری؛ دەڤی؛ پێوەندیدار یان سەر بە دەمەوە.

**دهدار** / dehdār، ـها؛ ـان/: *اسم.* کوێخا؛ کۆخا؛ کێخا؛ قێخا؛ قەیخا؛ دێدار؛ دێهدار؛ نوێنەری دەوڵەت لە میرەدێیەک کە لە ژێر چاوەدێری بەخشداردا کار دەکا.

**دهدهی** / dahdahî/ ☜ کسر اعشاری، **کسر**

**دهر** / dahr ، دُهور/: [عربی]*اسم. [ادبی]* ۱. ڕۆژگار؛ ڕۆژگار ‹مرد باید که در کشاکش دهر/ سنگ زیرین آسیا باشد: لە بگرە و بەردەی ڕوژگارا پیاو دەبێ/ قورس و قایم هەر وەکوو بەردەئاش بێ› ۲. دنیا؛ دنێ ‹دهر بسیار چو من بی سر و سامان دیده‌ست/ چه تفاوت کند این بی سر و سامانی ما: دنیا وەک من بێ ئەنوای یەکجار دیوە/ فەرقی چیە ئەمن ڕووت یان پۆشتە بم›.

**دهره** / dahre ، ـها/: [سنسکریت]*اسم.* دارپاچ؛ تەرداس؛ تەورداس؛ چەشنێ داسی قورس و دەسک‌درێژ.

**دهری** / dahrî ، ـها؛ ـان؛ ـون/: [عربی]*اسم.* دەهری؛ لە دین دەرچوو؛ کەسێ کە جیهان بە هەربوو و هەرماو و بێ ئافرێنەر دەزانێ.

**دهستان** / dehestān ، ـها/: *اسم.* میرەدێ؛ گوندی قەوغا؛ کۆمەڵەی چەند دێی لێک نزیک کە ناوچەیەک بەدی دێنێ و بە دەستی کوێخایەک بەڕێوە دەچێ.

**دهش** / deheš, daheš/: *اسم. [ادبی]* دەهندەیی؛ کار یان ڕەوتی بەخشینی پارە و ماڵ بە دیتران ‹رسم دهش ز همت اهل جهان مجوی/ طفلند و دستشان بە دهان آشناتر است: دەهندەیی بۆ دنیادۆست دەس نادا/ وەک منداڵە و دەستی بە زاری فێرە›.

**دەشاهی** / dahšāhî ، ـها/: *اسم. [قدیمی]* دەشایی؛ سکەیەک لە ئێران بەرانبەر بە ۵۰ دینار (نیو قران) کە تا دەکانی ۱۳۴۰ برەوی هەبووە.

**دهشت** / dehšat/: [عربی]*اسم. [ادبی]* ترس؛ تەرسی؛ بیم؛ سەهم؛ سامی؛ هەراس؛ خۆف.

**دهقان** / dehqān ، ـها؛ ـان؛ دهاقین/: [معرب از فارسی]*اسم.* وەرزێر؛ وەرزیەر؛ وەرزیار؛ کێلگەر؛ دێهاتی؛ گوندنشین؛ دێ‌نشین؛ بەتایبەت پیاوێ

که له دێدا له سەر زەوی کار دەکا.

**دهقانی** / dehqānî/: [معرب] *صفت.* وەرزێری؛ گوندی؛ دێ‌نشینی؛ پێوەندیدار یان سەر بە گوندنشینانەوە ‹خانەی دهقانی: مالی وەرزێری›.

**دهکده** / dehkade ، ـها/: *اسم.* گوند؛ دێ؛ لادێ؛ ئاوایی، بەتایبەت شوێن و ئاقاری دەور و بەری.

**دهکوره** / dehkûre ، ـها/: *اسم.* کوێرەدێ؛ کۆرەدێ؛ دێیەکی زۆر چکۆلە، وێرانە و کەمجەماوەر ‹معلوم نبود از کدام دەکوره آمده است: کەس نەیدەزانی لە کام کوێرەدێوە هاتووە›.

**دهگان** / dahgān/: *اسم.* ١. جمع ☜ **دهه** ٢. دەکان؛ پاش یەکان؛ دووهەم ڕیزی ژمارەگەلی سروشتی.

**دهل** / dohol ، ـها/: *اسم.* دەهۆڵ؛ دهۆڵ؛ دهۆل؛ دەهـوول؛ دەول؛ دۆڵ؛ داوەڵ؛ دێول؛ نەقرا؛ تەپلی گەورەی بەزمگێران.

▣ **دهل زیر گلیم زدن:** *[کنایی]* خۆر بە تۆپەقوڕ داپۆشان؛ دەوڵ لە ژێر عاباوە لێدان؛ بۆ شاردنەوەی ڕاستیەک بێهۆ تێکۆشان.

**دهل کسی دریده شدن:** *[کنایی]* تەشتی کەسێ لە سەر بان داکەفتن؛ ناوی کەسێک زڕان؛ قالی کەسیک دەرچوون؛ ڕازی کەسێک ئاشکرا بوون.

**دهل کسی را زدن:** *[کنایی]* ناوی کەسێ لە کەڕەناوە خوێندن؛ کێشانە خواری کەسێ؛ کەسێک لە پلەوپایەی لا بردن؛ دەر کردن.

**دهل‌دریده** / doholdarîde ، ـها/: *صفت.* *[کنایی]* ناوزڕاو؛ ناوزڕیاگ؛ بەدناو؛ ڕسوا.

**دهل‌شکم** / doholšekam ، ـان/: *صفت.* *[کنایی]* زکدڕاو؛ سکەڕۆ؛ زکەڕۆ؛ فرەخۆر؛ لەمدڕیا؛ نەوسن.

**دهلوی** / dehlavî ، ـها؛ ـان/: *صفت.* دیهلەوی؛ سەر بە شاری دیهلی لە هێند.

**دهلیز** / dehlîz ، ـها/: [معرب از فارسی] *اسم.* دالان؛ دالوو: ١. ڕاڕەو؛ ڕێگەی سەر داپۆشراوی ناو مالان ٢. بوارگەیەک لە ئەشکەوت بە شێوەی ڕاڕەوی پێچەڵپێچ ٣. *[کالبدشناسی]* پێکهاتەیەکی پێچاوپێچ لە ئەندامانی ناوەوەی جەستەدا، وەک هی گوێ و دڵ.

**دهم** / dahom/: *صفت.* دەهەم؛ دەهەمین؛ دەیەم؛ دەیەمین؛ بە پلە، ڕیز یان جێگای دەوە ‹نفر دهم: کەسی دەهەم›.

**دهمی** / dahomî ، ـها/: *ضمیر.* دەهەمی؛ دەیەمی؛ ئەوەی کە لە ڕیز یان جێگای دەهەمدایە.

**دهمین** / dahomîn/: *صفت.* دەهەمین؛ دەیەمین؛ دەهەم؛ دەیەم؛ بە ڕیز، پلە یان جێگای دەهەمەوە.

**دهن** / dahan/ ☜ **دهان**

**دهن‌بین** / dahanbîn/ ☜ **دهان‌بین**

**دهن‌بینی** / dahanbînî/ ☜ **دهان‌بینی**

**دهن‌پرکن** / dahanporkon/ ☜ **دهان‌پرکن**

**دهن‌دریده** / dahandarîde/ ☜ **دهان‌دریده**

**دهن‌دره** / dahandarre/ ☜ **دهان‌درّه**

**دهنده** / dahande ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* دەهندە: ١. بدە؛ ئەوەی کە شتێ دەدات ٢. *[پزشکی]* کەسێک کە لەوەوە خوێن بۆ نەخۆشێک یان ئەندامێ بۆ پەیوەندکردن بە کەسێکی تر دەگیرێت * بەرانبەر: **گیرنده**

**دهن‌سوز** / dahansûz/ ☜ **دهان‌سوز**

**دهن‌کجی** / dahankacî/ ☜ **دهان‌کجی**

**دهن‌گشاد** / dahangošād/ ☜ **دهان‌گشاد**

**دهن‌گنده** / dahangonde ، ـها/: *صفت.* *[نامتداول]* دەمزل؛ خاوەن زاری زل و ناشیرین.

**دهن‌گیره** / dahangîre/: *اسم.* *[مجازی، گفتاری]* بەردڵ؛ خواردەمەنیەکی کەم کە لە نێوان فراوین تا شێو بۆ بەرگری لە برسیەتی دەخورێت.

**دهن‌لق** / dahanlaq/: *صفت.* *[مجازی، گفتاری]* زمانشڕ؛ زارشڕ؛ دەم نەوێستاو؛ دەم نەوێسیاگ؛

دەمدڕاو؛ دەمشڕ؛ دەمهەڵە؛ بەلۆک؛ زاردڕاو؛ قسەپەڕین؛ دەشۆ؛ دەڤشۆ؛ تێنەوەستاو ‹آدم دهن‌لق: مرۆی زمان‌شڕ›.

**دهـن‌لقـی** / dahanlaqî ، ـها/: اسم. [مجازی] زمـان‌شـڕی؛ زارشـڕی؛ دەم نەوەسـتاوی؛ دەم نەوێسـیاگی؛ دەمدڕاوی؛ دەمشـڕی؛ دەشـۆیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕازدار نەبوون ‹مبادا دهـن‌لقـی بکنـی و مـا را لـو بـدهی: نـەکا زمـان‌شـڕی بکـەی و بماندەیتە دەستەوە›.

**دهنـه** / dahane/: اسم. ۱. دەم؛ زارک؛ دەرگـا؛ درگـا؛ دەر؛ دەرقـەدامک؛ هـلۆلی سـەرووی شـتێکی ناوخاڵـی ۲. دەزگـا؛ چـاوە؛ یەکـەی ژماردنی دووکان ‹چهار دهنه مغازه داشت: چوار دەزگا دووکانی بوو› ۳. هەوسـار؛ لـەغاو؛ لـەخام؛ بلاوە؛ لەتە کانزایـەکی هەلـەک کـە لـە سـەر و دەمی چوارپای سواری (بەتایبـەت ئەسـپ) قـایم دەکەن.

**دهنـه** / dahne/: اسم. [زمین‌شناسی] مالاکیـت؛ کانیەکی سەوزی بەدیهاتوو لە کـەربوناتی مـس، کـە لـە گەوهەرسـازی و ڕەنگسـازیدا بـە کـار دەبرێ.

**دهنی**[1] / dahanî/: اسم. ۱. دەمـی؛ میکرۆفـونی تەلەفوون ۲. دەمنە؛ کونی سازگەلی بایی کە بۆ ژەندنیان دەبێ لێوی پێوە بچەسپێ.

**دهنی**[2]: صفت. [گفتاری] دەماوی؛ دەملێـدراو ‹بـا قاشق من بستنی خوردی، دهنی شد: بە کـەوچکی مـن بەستەنیت خوارد، دەماوی بوو›.

**دهور** / duhûr/: [عربی] جمعِ ☜ **دَهر**

**دهـــه** / dahe/: اسـم. ۱. /دهگـان/ دەکـان؛ کۆمەڵێکی دە دانەیی ۲. ـها/ دەیـەکان؛ هـەر کام لە بەشگەلی دە دانـەیی کـات ‹دهـەی سوم سـدەی بیـستم: دەیەکانـی سـێهەمی چـەرخی بیستەم›.

**دهه** / dehe/: صوت. [گفتاری] پەکوو؛ تەح؛ تـێح؛ پێح؛ حای؛ هەیهوو؛ وشەی سەر سووڕمان ‹دهه، این دیگه از کجا پیدا شد: پەکوو، ئەمە ئیتر لـە کوێـوە هات›.

**دەیک** / dahyek/: اسم. دەیەک؛ یـەک لـە دە؛ دە لە سەد؛ بەشێ لە دە بەشی شتێک.

**دی** / dey/: اسم. بـەفرانبار؛ بـەفرەنبار؛ مـانگی دەهەمی ساڵی هەتاوی ئێرانی کە سی ڕۆژە.

**دی** / dî/: اسـم. [ادبـی] دوێ؛ دوێنـێ؛ دوێکـە؛ دوێنێکە؛ دوێنەکە؛ دۆ؛ دۆهـ ؛ دی؛ هیزی.

**دیابـت** / diyābet/: [فرانسوی] اسم. [پزشکی] دیابێت؛ نەخۆشینی قـەن؛ نەخۆشـینی شـەکر؛ نەخۆشـینێک کـە لەگـەڵ زۆر بـوونی میـز، تینووەتی و زۆر بوونی ئووره لە خوێندا هاوڕێیە.

**دیاپـازون** / diyāpāzon ، ـها/: [فرانسوی] اسم. دیاپازون؛ ئامێرێکی چکۆلە بـە دوو لقـەوە (زۆتـر کانزایی) کە ئەگەر لقەکان بلەرێنەوە دەنگێک بە فریکانسی دیاریکراوەوە بـەدی دێ و لـە کـۆک کردنی سازگەلدا کەڵکی لێ وەردەگرن.

**دیات** / diyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **دِیه**

**دیاتومه** / diyātome ، ـها/: [فرانسوی] اسم. قەوزە؛ کەڤزە؛ جلشین؛ گیایـەکی وردیلـەی تـیرەی جلشینان بە ڕەنگی زەرد یان خورمـایی کـە لـە ئاوی سوێر و شیرین، لە سـەر خـاک یـان هـەر ڕووپەڕێکی شێدار، بە تەنیایی یـان بـە کۆمـەڵ دەژین و زۆرێک بەردی ئاهـەکی و سـەرچاوەی نەوتیان لێوە بەدی دێن.

**دیار** / dayyār/: [عربی] اسم. جووقـەوار؛ کـەس؛ دالەواز؛ زیندەوار؛ مشەکەر؛ یۆ؛ کەسێکی تەنیا و نەناس ‹در آنجا هیچ دیاری به چشم نمی‌خورد: لـەوێ جووقەوارێک بەدی نەدەکرا›.

**دیـار** / diyār/: [عربـی] اسم. سـەرزەوی؛ وڵات؛ سەرزەوین؛ سەرزەمین.

▣ **دیـار عـدم**: دوا هـەوار؛ ئـەو لا؛ مـەرگ ‹او را روانەی دیار عدم کرد: بەرەو دواهەوار بەڕێی کرد›.

**دیافراگم** / diyāf(e)rāgm ، ـها/: [فرانسوی] اسم. دیافراگم: ۱. گلێجە؛ ناوپەنچک؛ هەر پەردە یان

پێکهاتەیەکی جیاکەرەوە، بەتایبەت ئەو پەردە ئەستوورە کە هەڵۆلی زگ لە سینگ جیا دەکاتەوە ٢. پەڕەیەک لە دووربینی وێنەگری، تیلیسکوپ یان باقی ئامێرگەلێکی تیشکیدا کە ڕادەی تیشک چوونە ژووری دەزگایەک کەم و زۆر دەکاتەوە.

**دی‌اکسید** / dî'oksîd/: [فرانسوی] ☜ **دیوکسید**

**دیاگرام** / diyāg(e)rām ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. نەخشە؛ دیاگرام؛ گەڵاڵەیەکی هێڵی کە ڕیز و پێوەندیگەل پیشان دەدا.

**دیاگنوستیک** / diyāgnostîk/: [؟]/اسم. /پزشکی/ ڕەوتی ناسینی نەخۆشین.

**دی‌الکتریک** / dî'elekt(i)rîk ، ـها/: [فرانسوی] /اسم. بەرق‌ڕاگر؛ بە تایبەتمەندی یان هێزی بەربەست کردن و بەرگرتنی کارەباوە.

**دیالکتیک** / diyālektîk/: [فرانسوی]/اسم. ١. /منطق/ بناشت؛ گلتە؛ شێوەی وتوویژ و دەمەقاڵەی مەنتیقی بۆ گەیشتنە ڕاستەقانی ٢. /فلسفه/ بیرۆکەی فەلسەفەی گیئۆرک هیگل (١٧٧٠-١٨٣١ی ز.) کە بەو پێیە، بزاوی بیر لە ڕێگەی وتنەوەی تز (هێم) و بە دەست هێنانی ئانتی‌تز (بەرهێم/ دژهێم) ڕێ دەباتە سەنتز (هەم/ هێم) و ئەنجامی مەنتیقی ٣. /فلسفه/ بیرۆکەی فەلسەفی کارل مارکس (١٨١٨-١٨٨٣) کە بەو پێیە، ڕاستیەکانی جیهان لە سەر چوار بنەمای سەرەکی: گوران، هەڤگری دژگەل، ململانێی دژگەل و بازدان دادەمەزرێ ٤. لێکدانەوەی ئەم ڕەوتە ٥. بە کار بردنی ئەم بیرۆکە بەتایبەت لە لێکۆڵینەوەی بابەتگەلی کۆمەڵایەتیدا.

**دیالمه** / diyālame/: جمعِ ☜ **دیلمی**

**دیالوگ** / diyālog ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. وتوویژ؛ گفت‌وگۆ؛ دەمەتەقە؛ دەمەتەقێ.

**دیالیز** / diyālîz/: [فرانسوی از انگلیسی]/اسم. دیالیز: ١. شێوەی جیا کردنەوەی کلۆئیدگەلی ناو گیراوەیەک لە ماکی‌تر ٢. /پزشکی/ ڕەوتی پالاوتن و خاوێن‌کردنەوەی تراوی گورچیلە بە دەسگای تایبەت.

**دی.ان.اِ** / dî.en.e/: [انگلیسی]/اسم. /مخفف/ ماکی کیمیاوی خانۆکەی گیانەوەران و گیایان کە داگری ئاگاداریگەلی ژنیتیکی و خێزانیە.

**دیانت** / diyānat/: [عربی]/اسم. ١. دین ‹حکومت بر مبنای دیانت: حکومەت لەسەر بناغەی دین› ٢. دینداری ‹این کارها خلاف دیانت است: ئەم کارانە دژی دیندارین›.

**دیبا** / dîbā/: اسم. /ادبی/ دیبا؛ دێوا؛ دیوا؛ پارچەی ئاوریشمی گوڵدار.

**دیباچه** / dîbāče ، ـها/: اسم. سەرەتا؛ دەسپێک؛ دیباچە؛ دیواچە؛ بەرداشت؛ پێشەکی کتێب، بەتایبەت نووسراوە یان وتارێکی کورت لە هەوەڵی پەرتووکەوە ‹دیباچەی گلستان سعدی: سەرەتای گوڵستانی سەعدی›.

**دیپلم** / dîplom ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. دیپلوم: ١. بڕوانامەی تەواوکردنی خوێندنی دواناوەندی (پاش‌ناوەندی) ٢. بڕوانامەی دوایی هێنانی خوێندنی دوکتوری ٣. پەڕەیەک کە تێدا سەرپشکی یان شانازیەک بە کەسێک دەدرێت: **دیپلم افتخار**

▣ **دیپلم افتخار** ☜ **دیپلم ـ٣**

**دیپلمات** / dîplomāt ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ڕامیار؛ دیپلومات؛ کەسێ کە پیشەی لە بواری سیاسەت و پێوەندی لەگەڵ وڵاتانی‌تردایە.

**دیپلماتیک** / dîplomātîk/: [فرانسوی] صفت. ڕامیاری؛ دیپلوماتیک: ١. سیاسی ‹روابط دیپلماتیک: پێوەندی ڕامیاری› ٢. پێوەندیدار بە دیپلوماتەوە ‹مصونیت دیپلماتیک: پارێزراوی ڕامیاری›.

**دیپلماسی** / dîplomāsî ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ڕامیاری؛ سیاسەت؛ دیپلوماسی ‹دیپلماسی فعال: دیپلماسی گفتگو: سیاسەتی کارا؛ ڕامیاری وتوویژ›.

**دیپلمه** / dîplome ، ـها/: [فرانسوی] صفت.

دیپلۆمـه: ١. خـاوەن بڕوانامـەی خوێنـدنی دواناوەنـدی ‹دیپلمـەی هنـر: دیپلۆمـەی هونـەر› ٢. خـاوەن بڕوانامـەی خوێنـدنی دوکتـوری ‹دیپلمەی جراحی: دیپلۆمەی برینکاری›.

**دیت** / diyet ، ـها/: [؟]/اسم. دییێت؛ ئەنجومـەنی شۆرا یان قانوون دانان لە ئاڵمان، ئیسکاندیناوی و تاقمـێ لـە وڵاتـانیتـر (وەک لەهیـستان، مەجارستان و ژاپۆن).

**دیجور** / deycûr, dîcûr ، ـها/: [عربی]/اسم./ادبی/ شەوەزەنگ؛ شەوەزەنگە؛ تاریکەشەو؛ دەیجـوور؛ شەفتاری؛ شەوی تاریک و ئەنگوستەچاو ‹از پس این شب دیجـور سحر در راه است: ئـەم شـەوەزەنگە بەیانی لە دوایە›.

**دیجیتال** / dîcîtāl/: [انگلیسی] ☜ **دیجیتالی**

**دیجیتـــالی** / dîcîtālî/: [انگلیـــسی] صـفت. دیجیتاڵی: ١. خاوەن دەزگایـێ بـۆ وەرگـرتن و ناردنی هـەرچی پێـدراوە بـە شـێوەی ژمـارەی سیفر و یـەک بـە نیـشانەی بـوون یـا نـەبوونی سیگناڵی ئەلکترۆنیکی ‹دوربین دیجیتال: دووربینی دیجیتاڵ› ٢. بە شاشە یان دەزگـای پیـشاندان بـە شـێوەی ژمـارە ‹سـاعت دیجیتـالی: سـەعاتی دیجیتاڵی› ❊ **دیجیتال؛ دیژیتالی**

**دیـــد** / dîd/: اســم. ١. ڕوانگـــە؛ بینـــشت؛ بەرچاوڕوونی؛ توانایی ورد بوونەوە لە ڕووداوان بۆ ئەنجامـدان یـان ئـەنجام نـەدانیان ‹در زمینـەی صنعت دیـد وسیعی داشـت: لـە بـواری پیـشەسازیدا ڕوانگەیـەکی بـازی هـەبوو› ٢. بینـایی؛ وینـایی؛ هەتەر؛ سۆما؛ هانا؛ نـووت؛ بڕشـت ‹دیـد چـشمش خیلی کم شده بود: بینایی چـاوی زۆر کـەم ببـووەوە› ٣. دیمانە؛ دیـەنی ‹دید و بازدیـد: دیـەنی و دیـدار› ٤. بەرجەوەنـــد؛ بەرجـــەوەن؛ بەرژەوەنـــد؛ بەرچاوگە؛ بەرچاو ‹دید سمت جنوب خیلـی زیباسـت: بەرجەوەندی لای باشوور زۆر جوانە›.

▣ **دیـد داشـتن**: ١. بـە بەرژەوەنـد بـوون؛ بەرجەوەندار بوون ٢. لە بـەر چـاو بـوون؛ لـە هانای چاودا بوون؛ هەڤ دیتن.

**دید زدن**: دیتن؛ دین؛ بـە چـاوکردن؛ تماشـا کـردن؛ ڕوانـین؛ نـواڕین؛ مـەیزین؛ بـەرا دان؛ سەرتاتکی کردن؛ چەم وسەی؛ چاو لێکردن.

**دیـــدار** / dîdār ، ـهـا/: اسـم. ١. دیـدار؛ دیـار؛ دیمانە؛ کار یان ڕەوتی چاوپێکەوتن؛ سەرقوتان؛ دیتنی کەسێک بۆ وتووێژ یان پێوەندی ‹دیـدار با نمایندگان: دیدار لەگەڵ نوێنەران› ٢. سەرکێشی؛ کـار یـان ڕەوتی سـەر دان؛ ڕۆیـشتن بـۆ لای کەسێ یان جێگایەک بۆ ئاگادار بـوون لـە بـار و دۆخی ‹دیدار کردن از آسیب‌دیدگان سیل: سەرکێـشی کردن لە گەزنگازانی لافاو› ٣. /ورزش/ کێبـەرکێ. هەروەها: **دیدار کردن؛ به دیدار کسی/ جایی رفتن**

▣ **دیدار به قیامت**: دیار بە/ دیارەو قیامەت؛ ئیتر لە ژیاندا یەکتری نابینین.

▣ **دیداری تازه کردن**: چاو پێکەوتنەوە؛ چـەم پنەکەوتەی؛ دووبارە دیتنەوە، بەتایبەت دوای ماوەیەک.

**دیداری** / dîdārî/: صفت. دیـداری؛ دیمانـەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە دیتنەوە ‹آموزش دیـداری: فێرکاری دیداری›.

**دیدبان** / dîdebān/ ☜ **دیدەبان**

**دیـدرس** / dîdres/: اسـم. چاوپێـک؛ چـاودی؛ چاوبڕ؛ هەتەر؛ لە مەودایەکدا کە چاو هانای بکا.

**دیدســـنج** / dîdsanc ، ـهـا/: اسـم. ئـامێری ئەندازەگرتنی مەیدانی بینایی و هانای چاو.

**دیدسنجی** / dîdsancî ، ـها/: اسم. ئەندازەگرتنی مەیدانی بینایی و هانای چاو.

**دیدگانی** / dîdegānî/: اسم. ئوپتیـک؛ لقـێ لـە زانستی فیزیک کە لە تایبەتمەندیگەلی تیـشک، بەرهەم هێنان و بڵاو بوونـەوەی لـە کۆئەنـدامی بیناییدا دەکۆڵێتەوە.

**دیـدگاه** / dîdgāh ، ـهـا/: اسم. ڕوانگـە؛ بـیر و بۆچـوون؛ بۆچـوون؛ شـێوەی داوەری ‹خواسـتم دیدگاه شما را دربارەی انتخابات اخیر بـدانم: ویـستم

ڕوانگەی ئێوە سەبارەت بەم هەڵبژاردنە دواییە بزانم›.

**دیدن** / dîdan/: مصدر. متعدی. لازم. // **دیدی**: دیت؛ **می‌بینی**: دەبینی؛ **ببین**: ببینە// دین؛ بینین؛ دیتن؛ وینەی؛ وینتەی؛ ویناى: ☐ متعدی. ١. وەرگێرانی دیمەنێک لە چاودا، ناردنی وێنەکەی بۆ مێشک و لێکدانەوەی ‹کسی را دیدن: کەسێک دیتن› ٢. ڕوانین؛ نۆڕین؛ ڕامینان؛ فتراندن؛ هەونیایش؛ هاسایش؛ وەنیایش؛ دیەی؛ دیای؛ تماشاکردن ‹دیدن فیلم: دیتنی فیلم› ٣. سەرکێشی کردن ‹به دیدن عمویم رفته بودم: چووبووم بۆ بینینی مامم› ٤. هەڵسەنگاندن، داوەری یان پێش‌بینی کردن ‹آیندەی او را درخشان می‌بینم: داهاتوویەکی ڕوونی بۆ دەبینم› ٥. ویزیت‌کردن ‹امروز دکتر مریض نمی‌بیند: ئەوڕۆ دوکتور نەخۆش نابینیت› ٦. بۆ هاودەسی و ساخت و پاخت چوون بۆ لای کەسێک ‹کدخدا را دیدن و ده را چاپیدن: کوێخا دیتن و دێ تالان‌کردن› ٧. بۆ کارێک بڕیاردان ‹برو أستادکاری را ببین بیاید این را تعمیر کند: بچۆ وەستاکارێک ببینە بێت ئەمە دروست بکاتەوە› ☐ لازم. ٨. دیەی؛ دیای؛ هەبوونی سۆمای چاو ‹چشمش خوب می‌دید: چاوی باشی دەبینی› ٩. کاری هاوکرد بە واتای هەڵکردن و کێشان ‹رنج دیدن: ڕەنج دیتن›.

■ صفت فاعلی: **بیننده** (بینەر)/ صفت مفعولی: **دیده** (بینراو)/ مصدر منفی: **نَدیدن** (نەبینین/ نەدیتن)

⊡ **دیدن کردن**: دیدار کردن ☜ **دیدار**

**به دیدن کسی رفتن**: به دیدار او رفتن ☜ **دیدار**

**دیدنی** / dîdanî/: صفت. دیتنی؛ دیەنی؛ دڵڕفێن؛ تماشایی؛ تواشایی؛ شیاوی دیتن.

**دیدوبازدید** / dîd-o-bāzdîd/: اسم. دیەنی و دیدار؛ دیمانە؛ هاتوچوو؛ ئامشەوڕەفت؛ ئامەولوای.

**دیدور** / dîdevar/ ☜ **دیده‌ور**

**دیده**[1] / dîde، ـها/: اسم. ١. ـگان/ [ادبی] دیدە؛ دیە؛ تیە؛ چاو؛ چەم؛ چەعف ‹نور دیده: نووری دیدە› ٢. بینراوە؛ دیتراوە؛ ئەوەی کە بینراوە (زۆرتر بە شێوەی کۆ).

⊡ **دیده از جهان فرو بستن**: [کنایی] کۆچی دوایی کردن؛ چاو لێکنان؛ ماڵاوایی یەکجاری کردن؛ مردن ‹استاد حمدی در سال ١٣۶۶ دیده از جهان فرو بست: مامۆستا حەمدی لە ساڵی ١٣٦٦دا کۆچی دوایی کرد›.

**ـ دیده**[2]: پیواژه. ـــ دیتوو: ١. ـــ دیدە؛ ـ دیە؛ ـ بینیو؛ تاقی کردوو یا چاوپێکەوتوو ‹جهاندیده: جیهان‌دیتوو› ٢. وەبەر شتێ کەوتوو ‹بلادیده: بەلادیتوو›.

**دیده‌بان** / dîdebān، ـها/: اسم. دیدەوان؛ چاویار؛ تیەڤان؛ نێرینڤان؛ نێرەڤان؛ گۆیار؛ پاسەوانێ کە لە ڕوانگەوە دەڕوانێتە دەور و بەردا تا ئەگەر کەسێ یان شتێ نزیک بووەوە، هەواڵ بدا: **دیدبان**. هەروەها: **دیده‌بانی؛ دیدبانی**

**دیده‌بوسی** / dîdebûsî، ـها/: اسم. ماچومووچ؛ ڕامووسی؛ کاری ڕامووسینی (بەتایبەت سەر چاوی) کەسێ بە نیشانەی گەش بوونەوە لە بینینی ‹با هم دیده‌بوسی کردند: پێکەوە ماچومووچیان کرد›.

**دیده‌ور** / dîdevar، ـها؛ ـان/: اسم. [نظامی] دیدەوەر؛ پێشەنگ؛ پێشاهەنگ؛ سەرباشقە؛ ئەوی بۆ ئاگاداری لە هەبوونی دژمن و هەواڵدانی، بە مەودایەکی دیاریکراو لە پێش هێزی خۆییەوە ڕێ دەپێوێ.

**دیر** / deyr، ـها/: [معرب از سریانی] اسم. دەیر؛ پەرستنگایەک کە ڕەبەنانی خاچپەرستی تێدا پێکەوە دەژین و پەرستش دەکەن.

**دیر**[1] / dîr/: اسم. دێر؛ دێرس؛ درەنگ؛ کاتێکی درێژخایەن ‹چقدر دیر! چەند دێر›.

**دیر**[2]: صفت. دێر؛ دێرس؛ درەنگ؛ هەڵکەوتوو لە

ساتی دوای کاتی شیاو و ڕەچاوکراودا ‹فردا دیر است، امروز باید کاری کرد: بەیانی دیرە، ئەمڕۆ دەبێ کارێ بکرێ›.

▣ **دیـر بـودن:** دێـر بـوون؛ دێـر بیـەی؛ شـیاو نەبوونی کات بە بۆنەی بە سەر چوونیەوە ‹فردا خیلی دیر است: سبەینێ زۆر دیرە›.

**دیـر شـدن:** دێـر بـوون؛ درەنـگ بـوون؛ دێـر پنەشیەی؛ بە سەر چـوونی کـاتی شـیاو یـان دیاریکراو ‹دیر شد، ممکن است به هواپیما نرسیم: دیرە ڕەنگە نەگەینە فڕۆکەدا›.

**دیـر**[3]: *قیـد*. دێـر؛ درەنـگ؛ دوای کـاتی شـیاو و ڕەچاوکراو ‹دیر آمده‌ای و می‌خواهی زود بروی؟!: دێـر هاتووی و دەتەوێ زوو بڕۆی؟!›.

▣ **دیر رسیدن:** دێرگەیشتن؛ درەنگ‌گەیین؛ دێر یـاوەی؛ دێـر پەنـەیاوای ‹دیـر رسـیدی همـه را خوردیم: دێرگەیشتی هەمووبمان خوارد›.

**دیر کردن:** درنـگ/ دێرکـردن؛ دێرکـەردەی؛ نـەهاتن یـان نەگەیـشتن لـە سـەر کـاتی ڕەچـاوکراودا ‹آزاد امـروز دیـر کـرد: ئـازاد ئەمڕۆ درنگی‌کرد›.

**دیر مانـدن:** کەوتنـە دێـر؛ کـەوتـەی وەدێـر؛ کەوتنە درەنگەوە؛ ماوەیەکی زۆر مانەوە.

**دیر-**[4]: *پیشوازه*. دێر- : ۱. دوای کاتی هەمیشەیی ‹دیررس: دێرڕەس› ۲. لە ماوەیەکی درێژ هـاوڕێ لەگەڵ دژواریدا ‹دیرباور: دێربڕوا›.

**دیرآشنا** / dîrāšnā/: *صفت*. ساردوسڕ؛ نـەکوڵ؛ دێرجۆش؛ بەبێ توانایی یان هۆگرەتی بـۆ بوونـە دۆست لەگەڵ دیتراندا. هەروەها: **دیرآشنایی**

**دیربـاور** / dîrbāvar ، ـها؛ ـان/: *صفت*. دێربـڕوا؛ دێربـاوڕ؛ لاسـار؛ بـە خـۆ و خـدەی دێـر بـڕوا کردنەوە.

**دیربەدیر** / dîrbedîr/: *قیـد*. دێراودێر؛ دێر- دێـر؛ بە ماوەگەلی زۆرەوە ‹دیربەدیر می‌آمد؛ دیربەدیر او را می‌بینم: دێراودێر دەهات؛ دێر- دێر دەیبینم›.

**دیرپا** / dîrpā/: *صفت*. درێژخایـەن؛ درێژخـایێن؛ زۆر پێ چوو؛ بە پایـەداری یـان خایـانی زۆرەوە ‹سرمای دیرپا؛ زمستان دیرپا: سـەرمای درێژخایـەن؛ زستانی درێژخایین›.

**دیرپایی** / dîrpāyî/: *اسم*. درێژخایەنی؛ دۆخ یان چۆنیەتی پایەدار بوون.

**دیرجوش** / dîrcûš/: *صفت*. ۱. *[مجازی]* سـارد و سڕ؛ سەرد و سڕ؛ بـەبێ هـۆگرەتی یـان توانـای دامەزراندنی پێوەندی لـە ماوەیـەکی کـەم یـان پێوەندیەکی نزیک لەگەڵ دیتراندا ‹آدم دیرجوش: مرۆی سـارد و سـڕ› ۲. دێرکـوڵ؛ بـەبێ خێرایـی شیاو لە کوڵاندا ‹مایع دیرجوش: تـراوی دێرکـوڵ› ۳. دێرکولێن؛ دێرکوڵ؛ بەبێ خێرایی لە هێنانـە کوڵدا ‹سماور دیرجوش: سەماوەری دێرکوڵ›.

**دیردم** / dîrdam/: *صفت*. دێردەم؛ پێویـست بـە کاتی زۆر بۆ دەمکێـشان ‹ایـن چـای خیلـی دیـردم است: ئەم چاییە زۆر دێردەمە›.

**دیـــررس** / dîr.ras/: *صــفت*. *[زیـسـتشناســی]* دێرڕەس؛ دێریاو؛ ئاڤزەمکی؛ بێخێرایی پێویست لە گەیشتن یان پێگەیشتندا ‹سیب دیررس: سێوی دێرڕەس›.

**دیرک** / dîrak ، ـها/: *اسم*. دیـرەک؛ دیـرەگ: ۱. بالار؛ کاریتە؛ کۆترە؛ چلاک؛ بەسـت؛ گـرش؛ ڕاژ؛ داری دارەڕا ۲. تیری چێوی.

**دیرکـرد** / dîrkard, dîrkerd/: *اسم*. دێرهـات؛ دواکەوت؛ دێرکـرد؛ کـار یـان ڕەوتی جێبـەجێ نـەبوون لـە کـاتی شـیاو و دیـاریکراودا ‹بهـرەی دیرکرد: سووی دێرهات›.

**دیرگـاه** / dîrgāh/: *اسم*. *[ادبی]* دێـر؛ درەنـگ؛ درەنگان؛ دێروەخت.

**دیرگــداز** / dîrgodāz/: *صــفت*. دێرتــاو؛ بــە تایبەمەندی تاوینەوە بە سەختەت و لـە دەمـای زۆر باندا.

**دیرگوار** / dîrgovār/: *صفت*. قورس؛ دێرهـەزم. بەرانبەر: **آسانگوار**

**دیروز**[1] / dîrûz/: *اسم*. دوێکە؛ دوێنێ؛ دوێنەکـە؛

دوێنێکه؛ دوینه؛ دوەنا؛ دینیا؛ دێنێ؛ هیزی؛ هیزیکەی؛ هێزیکه؛ دوێ؛ دونێ؛ دووش؛ دۆهـ ؛ دۆ: ۱. ڕۆژی پێش لە ئەمڕۆ ‹دیروز چهارشنبه بود: دوێکە چوارشەممە بوو› ۲. *[مجازی]* کاتی پێشووی نزیک بە ئێستا ‹این کارها و حرفها مال دیروز بود، نه امروز که دنیا عوض شده است: ئەم کار و قسانە هی دوێکە بوو، نە ئەوڕۆ کە هەموو شتێک گۆڕاوە›.

**دیروز**[۲]: *قید.* دوێکه؛ دوێنێ؛ دوێنەکە؛ دوێنێکه؛ دینیا؛ دوەنا؛ دوینه؛ دێنێ؛ هیزی؛ هیزیکەی؛ هێزیکه؛ دوێ؛ دونێ؛ دووش؛ دۆهـ ؛ دۆ: ۱. لە ڕۆژی پێشوودا ‹دیروز به من خبر دادند: دوێنێ خەبەریان پێدام› ۲. لە ماوەی پێشووی نزیکدا ‹دیروز دستم را می‌بوسید، امروز سرم را می‌شکند!: دوێکە دەستی ماچ دەکردم، ئەمڕۆ سەرم دەشکێنێ!›.

**دیروزی** / dîrûzî/: *صفت.* دوێنێ؛ دوێکە؛ دوێ؛ دونێ: ۱. پێوەندیدار بە دوێکەوە ‹ناهار دیروزی خوشمزه بود: فراوێنی دوێنێ خۆش بوو› ۲. *[مجازی]* جاران؛ پێشووتر؛ پێوەندیدار بە ڕۆژگاری بەرینەوە ‹او دیگر آن آدم دیروزی نیست: ئەو ئیتر مرۆکەی جاران نیە›.

**دیروقت** / dîrvaqt/: [فارسی/ عربی]*اسم.* درەنگان؛ دێر؛ درەنگ؛ دێروەخت؛ هەرەی؛ ماوەی دوای کاتی دیاریکراو ‹شب تا دیروقت کار می‌کرد: شەو تا درەنگانێ کاری دەکرد›.

**دیرهضم** / dîrhazm/: [فارسی/ عربی] *صفت.* قورس؛ دێرهەرس؛ دێرهەزم؛ دۆخی خواردنێک کە بۆ توانەوە لە گەدەدا نیازی بە کاتێکی زۆرە ‹کوفته خیلی دیرهضم است: کفتە زۆر قورسە›.

**دیری** / dîrî/: *اسم.* دێر؛ دێری؛ درەنگی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دێر بوون ‹گر مرد رهی غم مخور از دوری و دیری: ئەگەر ڕێبواری بەڕاستیت خەمی دووری و دێری مەخۆ›.

**دیری** / dî:rî/: *قید. [ادبی]* دەمێک؛ سەردەمێک؛ ماوەیەک؛ کاتێک؛ ماوەیەکی زۆر ‹دیری‌ست که از یار پیامی نرسیده است: دەمێکە یار هەواڵێکی نەداوە›.

**دیریاب** / dîryāb/: *صفت. [ادبی]* ۱. دەگمەن؛ دێردۆز؛ تایبەتمەندی ئەوەی دێر پەیدا دەبێ یان بەرهەم دێ ۲. *[نامتداول]* گێل؛ حۆل؛ گێژ؛ کەمئاوەز؛ لاژ؛ لاژگ.

**دیرین** / dîrîn/: *صفت. [ادبی]* دێرین؛ لەمێژین؛ لەمێژینە؛ کەونارا؛ پێوەندیدار یان سەر بە کاتی پێشوو ‹دوست دیرین: دۆستی دێرین›.

**دیرینزا** / dîrînzā/: *اسم.* پالێئۆزین؛ دوو خولی ئوسین و لیگوسین لە خولی سێهەم لە زەوینناسیدا.

**دیرین‌زیوی** / dîrînzîvî/: *اسم.* دێرینژیواری؛ کۆنژیواری؛ سێهەمین قۆناغی مێژووی زەوین یان خولی هەوەڵ کە ماسیان، دووژینان، خزۆکان و مێرووانی تێدا بەدیهاتن: **پالئوزوئیک**

**دیرین‌شناس** / dîrînšenās ، ـان/: *اسم.* کەوناراناس؛ لەمێژینەناس؛ دێرسی ناس؛ کەسێ کە زانست و خوێندنی لە بواری لەمێژینە ناسیدایە.

**دیرین‌شناسی** / dîrînšenāsî/: *اسم.* لەمێژینەناسی؛ کەوناراناسی؛ دێرین‌ناسی؛ دلرسی ناسی؛ لێکۆڵینەوەی زانستی بەردینەگەل لە بواری ناسینی ژیانی گیا و گیانەوەران لە پێشوودا.

**دیرینگی** / dîrînegî/: *اسم.* لەمێژینەیی؛ کەونارایی؛ دێرینی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دێرینە بوون.

**دیرین‌نگاری** / dîrîn.negārî/: *اسم.* ۱. لێکۆڵینەوە و ڕاژەی زانستی بەڵگەگەلی کۆن ۲. بەڵگەگەلی کۆنی ڕاژەکراو * **پالئوگرافی**

**دیرینه** / dîrîne/: *صفت.* لەمێژینە؛ دێرینە؛ دێرین؛ پێشوونە؛ قۆجە؛ زووگین؛ پێوەندیدار بە کاتی درێژەدارەوە ‹یار دیرینه: یاری دێرین›.

**دیرینه‌سنگی** / dîrînesangî/ ☜ **پارینه‌سنگی**

**دیـز** / diyez/: [فرانـسوی]/اسـم. [موسـیقی] دیێـز؛ نیشانەیەک بۆ نیـو پـەردە بردنـە سـەر و زیـلتر کردنی دەنگی نوتێک.

**دیـزل** / dîzel ، ـهـا/: [آلمـانی]/اسـم. دیـزڵ: ١. موتوری دیزڵـی ٢. ماشـینێک کـە موتـوری دیزڵیە، بەتایبەت کامیون.

**دیزلـی** / dîzelî/: [آلمـانی] صـفت. دیزڵـی؛ بـە موتوری دیزڵیەوە.

**دیزی** / dîzî ، ـها/: اسم. دیـزی؛ دیـزە: ١. دیـز؛ دیـزە؛ دیـزک؛ دیگـە؛ کیتـە؛ کیتەڵـە؛ خۆنـە؛ خوانکە؛ هۆمەلێرە؛ دەفری قووڵـی سواڵـەت بـۆ گۆشتاو لێنان ٢. [مجازی] گۆشتاوێ کە لـە نێـو ئەو دەفرە لێنراوە ‹رفتیم قهوه‌خانه دیـزی خـوردیم: چووین بۆ قاوەخانە دیزیـمان خوارد›.

**دیژیتال** / dîjîtāl/: [فرانسوی]/اسم. گـل انگـشتانه ☜ **انگشتانه ـ٣**

**دیژیتالی** / dîjîtālî/: [فرانسوی] ☜ **دیجیتالی**

**دیس**[1] / dîs ، ـها/: [از فرانسوی]/اسم. دیس؛ قـاپ؛ لەنگەری؛ تیفسی؛ دەفری گراران؛ دەفری پان و پەل زیاتر بۆ چێشتی وشک و شیرینی لـە سـەر دانان ‹یک دیـس پلـو را بـه تنهـایی خـورد: دیـسێک پلاوی بە تەنیا خوارد›.

**ـ دیس**[2]: پیواژه. ـ ئاسا؛ ـ گـوێن؛ گۆرەبا؛ وەک ‹تاقدیس؛ تندیس: تاقاسا؛ تەناسا›.

**دیسانتری** / dîsāntrî/: [فرانسوی]/اسـم. [پزشـکی] سکەشۆرەی خوێنی؛ زکچوونا خوێنی.

**دیـسپروزیم** / dîsp(e)roz(i)yom/: [انگلیـسی/ فرانسوی]/اسـم. دیـسپرۆزیوم؛ تـوخمی کیمیـایی کانزایی دەگمەن، لە دەستەی لانتانیدەکان، بـە ژمارەی ئەتومی ٦٦ و کێـشی ئـەتومی ١٦٢,٥٠ کە لە سازدانی تیشکی لەیزردا بە کار دەڕوا.

**دیـسک** / dîsk ، ـهـا/: [فرانسوی]/اسـم. دیـسک: ١. [مکانیک] هـەر چەشـنە ڕووپـەڕێکی سـاف و جەغزئاسـا و بازنـەیی لـە ئـامێر و ماشـیندا ٢. [کالبدشناسـی] کرۆژنەیـەکی خـڕتۆڵ کـە دە نێوان گازەرادایە و لێـک تـرازانی هـۆی ئـێش و ئازارە ٣. [ورزش] ڕووپەڕێکی جەغزی، زۆرتـر لـە چێو یان پلاستیک بە کێشی ٢ کیلۆگرەم کە لە وەرزشگەی هاویشتنیدا بە کار دەبرێت ٤. ☜ **فلاپی‌دیسک**

▣ **دیسک فشرده** ☜ **سی‌دی**

**دیسکت** / dîsket/: [فرانسوی] ☜ **فلاپی‌دیسک**

**دیسک ران** / dîskrān/: [فرانـسوی/ فارسـی] ☜ **دیسک‌گردان**

**دیسک‌گـردان** / dîskgardān ، ـهـا/: [فرانـسوی/ فارسـی]/اسـم. دیـسک‌گـەڕێن؛ دیـسک‌سـووڕێن؛ بەشێک لە کۆمپیۆتەر کـە دیـسکی تێدەخـەن: **دیسک‌ران؛ درایو**

**دیسکو** / dîsko/: [فرانسوی] ☜ **دیسکوتک**

**دیـسکوتک** / dîskotek ، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. دیسکۆ؛ دیسکۆتیک؛ جێگایـەک بـۆ هەڵـپەڕکێ هاوڕێ لەگەڵ هەوای باوی ڕۆژدا: **دیسکو**

**دیـسیپلین** / disiplîn/: [فرانـسوی]/اسـم. ١. ڕێـکوپێکـی؛ تـەکووزی؛ مرێـسی ٢. دیـسیپلین؛ ڕشـتەیەکی دیـاریکراوی زانستگایی.

**دیشب**[1] / dîšab/: اسم. دوێـشەو؛ دوێنـێ‌شـەو؛ دیشەو؛ دوەشەو؛ دوەشەوە؛ دوشینا؛ شەوی دی؛ شڤێ دی؛ شەڤا بۆری؛ ئیزی شەو؛ هیزی شەوێ ‹دیشب حالش بد شد: دوێشەو حالی تێکچوو›.

**دیـشب**[2]: قیـد. دوێـشەو؛ شـەوی دی؛ هیـزی شەوێ؛ لە شەوی پێشوودا ‹دیشب خیلی سردم شد: دوێشەو زۆرم سەرما بوو›.

**دیشبی** / dîšabî/: صفت. دوێشەو؛ دوێنـێ‌شـەو؛ هیزی شەوێ؛ پێوەندیدار یان سـەر بـە شـەوی پێشووەوە ‹غذای دیشبی خیلی خوشمزه بـود: شـێوی دوێشەو زۆر خۆش بوو›.

**دیشلمه** / dîšlame/: [ترکی] ☜ چـای دیـشلمه، **چای**

**دیفتری** / dîfterî/: [فرانسوی]/اسم. پێران؛ قـاس؛

بوغمە؛ بەغمە؛ وەناق؛ وناخ؛ نەخۆشیەکی گیرۆیە لە جۆری باسیل سەر هەڵدەدا و تۆژاڵێکی نووستەک لەسەر گەروو، قورقوڕانچک و بڕێجار چاو و شەرمی ژن دروست دەکا.

**دیفتونگ** / dîftong ، ـھا/: [فرانسوی] *صفت*. *[زبان‌شناسی]* بزوێنی تێکەڵ؛ وشەیەکی یەک برگەیی بە دوو دەنگی بە شوێن یەکدا (وەک: شەو ).

**دیفرانسیل** / dîfrānsiyel/: [فرانسوی]/*اسم*. دیفرانسیێل: ۱. *[ریاضی]* دەزگایێ لە حسێبی دیفرانسیێلدا ۲. دەزگایێ لە ماشێن و بڕێک ئامێری موتوری دیکەدا کە لە چەن چەرخدەندە لە نێو جابەیەکدا پێکهاتووە و بە هۆی مێل‌گاردانەوە وەگەڕ دەکەوێ و بە دوو مێل پلۆسەوە جووڵە دەخاتە چەرخەکان و بە هەر چەرخێ ڕێی خێرایی تایبەتی خۆی دەدا.

**دیکتاتور**[1] / dîktātor ، ـھا/: [فرانسوی]/*اسم*. ۱. لاسار؛ ملهوڕ؛ دیکتاتور؛ سەرسەخت؛ ماریس؛ مارز؛ کەسێ کە بەبێ ڕەچاوکردنی قانوون و ڕای خەڵکی حکوومەت دەکا ‹دیکتاتور شیلی: لاساری شیلی› ۲. ئارامبەند؛ کەرەستەیێ بۆ هێواش پێوەدانی درگا (دەرکی ئاسانسور و ماڵەچە) بە شێوەی خۆمەش.

**دیکتاتور**[2]: *صفت*. لاسار؛ سەرەڕۆ؛ هەڵەشە؛ سەهەندە؛ سەرسەخت؛ سەرڕەق؛ خوڕا؛ گوێنەدەر بە بیر و ڕای دیتران ‹مدیرمان خیلی دیکتاتور است: بەرپرسەکەمان زۆر لاسارە›.

**دیکتاتوری** / dîktātorî ، ـھا/: [فرانسوی]/*اسم*. لاساری؛ سەرسەختی: ۱. حکوومەتی تاکەکەسی یان گرۆیەک، بێ ئاوڕدانەوە لە بیر و ڕای خەڵک ۲. نیزامی حکوومەتی کە تەنیا لایەنگرانی خاوەن دەسەڵات دەتوانن چالاکی سیاسیان هەبێ.

▣ **دیکتاتوری پرولتاریا**: دەسەڵاتداری کرێکاری؛ بە دەست گرتنی دەسەڵاتی سیاسی و حکوومەت لە لایەن نوێنەرانی چینی کرێکارەوە و داسەپاندنی بەرنامەی سوسیالیستی و بە شەڕ وەستان لە هەمبەر نەیارانیانەوە.

**دیکتاتوری نظامی**: ملهوڕی چەکداری؛ ڕژیمێ کە بە یارمەتی ئەرتەش هاتۆتە سەر کار.

**دیکتە** / dîkte ، ـھا/: [فرانسوی]/*اسم*. ئیملا؛ ڕێنڤیس؛ خوێندنەوەی بابەتێ کە دیتران (بەتایبەت قوتابیان) بینووسن، بۆ ڕاهاتن بە نووسینی زمانێک.

▣ **دیکتە کردن**: داسەپاندن؛ سەپاندن؛ ئەرەسەپنەی (بەتایبەت لەمەڕ دەستوور و داخوازەوە) ‹آمریکا خواستهای خود را به دولتمردان ایران دیکته می‌کرد: ئامریکا نیازی خۆی بە سەر پیاوانی دەوڵەتی ئێراندا دادەسەپاند›.

**دیکته گفتن**: ئیملا وتن؛ ڕێنڤیس شاندان؛ ڤەکیشاندن؛ گوتنەوەی بابەتێ بە دیتران بۆ تاقی‌کردنەوەی لێهاتووییان لە نووسیندا. هەروەها: **دیکته نوشتن**

**دیکشنری** / dîkšenerî ، ـھا/: [انگلیسی]/*اسم*. ۱. فەرهەنگ؛ قامووسی وشە ۲. وشەنامە؛ وشەدان.

**دیگ** / dîg ، ـھا/: *اسم*. بەڕۆش؛ تیان؛ تیانە؛ تەیان؛ خەزان؛ خەزگان؛ قازان؛ قازانگ؛ قازانە؛ دیگە؛ قورشقە؛ جقە؛ نقرە؛ مەنجەڵ؛ مەنجێڵ؛ ساتل: ۱. دەفری گەورەی ویرەیی بۆ چێشت لێنان، کە بنەکەی هێندێک گەورەترە ۲. دەفری گەورەی سەرەدار بۆ لێنانی چێشت یان گەرم کردنی ئاو.

▣ **دیگ بخار**: تیانەی هەڵم: ۱. پاژێک لە ماشێنی هەڵم بۆ ئاو تێدا هێنانە کوڵ ۲. دەفرێکی کپ‌کراو کە ئاوی تێدا دەکوڵێنن و گەرما یان هێزی لێ بەرهەم دێنن.

**دیگ پاێن**: تیانەیەک کە تینی تراوی تێدا دەبەنە سەر بەبێ ئەوەی کە بێتە کوڵ.

**دیگ‌جن/ غول:** *[زمین‌شناسی]* کونێ کە لە تاشی ئەشکەوتانی قەراخی ئاودا بەدی‌دێ.
**دیگ زودپز:** دەفرێکی کانزایی بە درگایەکی کپەوە کە بۆ زوو کولانی چێشت کەلکی لێ‌وەردەگرن.
⊡ **دیگ طمع کسی بە جوش آمدن:** *[مجازی]* کەوتنە تەماعەوە؛ ددان تیژکردن.
**دیگ‌بر** / dîgbar/: *اسم. [قدیمی]* ئامێرێ لە چەرم وەک تۆشەبەرە کە قازانی چێشتیان پێ جێبەجێ دەکرد.
**دیگ‌بەسر** / dîgbesar/: *اسم. [گفتاری]* قازان بە سەر؛ تیانە بە سەر؛ شتێکی خەیالی کە مندالانیان پێ دەترساند.
**دیگپایە** / dîgpāye ، ـها/: *اسم.* دێسپا؛ سێ‌پێک؛ سێ‌لنگە؛ سێ پایەیەک کە قازانی لە سەر دادەنێن و لە ژێریدا ئاور دەکەنەوە: **دیگدان**
**دیگ‌جوش** / dîgcûš/: *اسم. [قدیمی]* پیازاو؛ کارواناشی؛ ئاولۆلێ؛ چەشنێ چێشتی هەرزان و تەوش.
**دیگچە** / dîgče ، ـها/: *اسم.* پاتیلە؛ پاتێل؛ تیانچە؛ دێگیلک؛ مەنجەلۆک؛ قۆشقانە؛ قازانچلێ؛ بەرۆشی گچکە.
**دیگدان** / dîgdān/ ☜ **دیگپایە**
**دیگر**[1] / dîgar/: *صفت.* دیکە؛ تر؛ تەر؛ دن؛ دی؛ دە؛ کە؛ همژی؛ ئەدی؛ دێگەر: ۱. جیاواز لەگەڵ ئەو ‹رنگ دیگر؛ کار دیگر: ڕەنگی تر؛ کاری تر› ۲. زۆرتر لەوە ‹دو کتاب دیگر هم گرفت: دوو کتێبی تریشی وەرگرت› ۳. دوا؛ دوایی ‹روز دیگر؛ سال دیگر: ڕۆژی تر؛ ساڵی دیکە›.
**دیگر**[2]: *قید.:* ۱. ئیتر؛ ئێتر؛ ئیدی؛ چیدی؛ پاش ڕووداوی باس لێکراو ‹دیگر پول ندارم: ئیتر پارەم نیە› ۲. ئیتر؛ ئێتر؛ هیتر؛ ئیدی؛ جگە لەوە ‹دیگر چە گفت؟؛ دیگر چە می‌خواهی؟: ئیتر چی گوت؟؛ ئیدی چت دەوێ؟› ۳. تر؛ تەر؛ دیکە؛ دیتر ٤. ئیتر؛ ئێتر؛ ئیدی؛ دیسان؛ هەما؛ هەمیسا؛ هەمیسان؛ هەمدیس ‹دیگر این کار را نکن: ئیتر ئەم کارە مەکە› ٥. سا؛ دەیسا؛ کە وایە ‹دیگر چیزی نگو: سا شتێ مەیژە›.
**دیگر**[3]: *حرف.* ئیتر؛ ئێتر؛ دیتر؛ ئیدی؛ ئیدیکە: ۱. وشەی ناڕەزایەتی بە نەبڕانەوەی ئاکارێ ‹ول کن دیگر: ئیتر واز بێنە› ۲. وشەی ناوازە ‹این دیگر کار بچەهاست: ئەمە ئیدی کاری مندالەکانە›.
**دیگران** / dîgarān/: جمعِ ☜ **دیگری**
**دیگرگون** / dîgargûn/ ☜ **دگرگون**
**دیگری** / dîgarî ، دیگران/: *ضمیر.* ئەوی‌تر؛ ئەوتر؛ ئەوتەر؛ هیتر؛ ئیکە؛ ئیدیکە؛ ئەڤی‌دیتر؛ یەونا؛ یەکێ‌تر؛ ئێدن؛ هێدن: ۱. کەس یان شتێ جگە لەوەی کە ئاماژەی پێ‌کراوە ‹یکی می‌آید، دیگری می‌رود: یەکێک دێ، ئەوی‌تر دەڕوا› ۲. کەس یان شتی دوایی ‹دیگری را بدە: ئەوی‌تر بدە›.
**دیلاق**[1] / deylāq ، ـها/: [ترکی] *اسم.* بەچکە وشتر.
**دیلاق**[2]: *صفت. [گفتاری]* لۆق؛ حۆل؛ لۆقلۆقی؛ درێژ تا ئێوارە؛ داهۆڵ؛ درێژ و لەڕ ‹یک جوان دیلاق ایستادە بود سر کوچە: لاوێکی لۆق لە سەر کۆلاندا ڕاوەستابوو›.
**دیلم** / deylam ، ـها/: *اسم.* دەیلەم؛ دەلەم؛ باریە؛ بێرەم؛ سلنگ؛ کوسکی؛ چڵ‌مێردە؛ ئامێرێک بۆ شکاندن و کون‌کردنی بەرد، دیوار و... بە شێوەی مێلەیێکی ئاسنی بە سەرێکی پانەوە.
**دیلماج** / dîlmāc ، ـها/: [ترکی] *اسم. [گفتاری]* وەرگێڕ؛ پاچڤەوان؛ دیلماج؛ دیلمانج ‹من خود زبان دارم، دیلماج نمی‌خواهم: من خۆم زمانم هەیە، وەرگێرم ناوێ›.
**دیلمی** / deylamî ، ـها؛ ـان؛ دیالمە/: *صفت.* دەیلەمی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە ڕەتەوەی دەیلەمیان (چەرخی ٤ و ٥ی کۆچی) ۲. پێوەندیدار بە دەیلەمی گێلان لە باکووری ئێراندا ۳. سەر بە بەندەری دەیلەم لە پارێزگای

بووشیهری ئێراندا.

**دیم** / deym/: اسم. دێم؛ دەیم: ١. دێمەکاری؛ دێمەچێنی؛ دەیمی؛ دەیمکاری؛ چەشنێک کشتوکاڵ کە ئاودێرانی تێدا نیە ٢. دێمزار؛ دیمەرۆک؛ زەوینێ کە ئاودێری لە بارانە و بەس ٣. دێمی؛ داهاتێ کە بێئاودێری بەرهەم هاتووە.

**دیمزار** / deymzār، ـها/: اسم. دێمزار؛ دێمەرۆک؛ دێمەکار؛ دەیمەزار؛ زەوینی دێم.

**دیمکاری** / deymkārî، ـها/: اسم. دێمەکاری؛ دێمەچێنی؛ دێمی؛ دەیمەکێڵی؛ کشتوکاڵ لە زەوینێ کە تەنیا ئاوی بارانی پێدەگا. هەروەها: **دیمکار**

**دیمه** / dîme، ـها/: اسم. نەرمەباران؛ خوناف؛ خوناو؛ خوناوکە؛ بارانی ئارام و بێڕەهێلە و هەورەتریشقە کە چەند ڕۆژ درێژەی هەیە.

**دیمی** [1] / deymî/: صفت. ١. دەیمی؛ دیمێ؛ دێمەکار؛ بەژک؛ پێوەندیدار بە دەیمەوە ‹گندم دیمی: گەنمی دەیمی› ٢. *[مجازی]* گۆترەیی؛ ڕەمەکی؛ هەرەکی؛ هەیکۆ؛ هاکۆ؛ هەروایی؛ بێبەرنامەڕێژی و تێفکرین ‹کار دیمی: کاری ڕەمەکی›.

**دیمی** [2]: قید. *[مجازی]* بە گۆترە؛ ڕەمەکی؛ هەرەکی؛ هەیکۆ؛ هاکۆ؛ بە شێوەی بێبەرنامە و بیر لێکردنەوە ‹دیمی بار آمدن؛ دیمی بازی کردن: بە گوترە بارهاتن؛ ڕەمەکی کایەکردن›.

**دین** / deyn، ـها؛ دیون/: [عربی] اسم. *[ادبی]* قەرزداری؛ قەرز؛ وام؛ وارە؛ وارە (بەتایبەت لە بواری ئاکاری و مافناسیەوە).

**دین** / dîn، ـها؛ ادیان/: [سامی/ ایرانی] اسم. دین؛ ئایین: ١. کۆمەڵە ئامۆژەگەلێک کە لە لایەن پێغەمبەرێکەوە ڕانراوە و بە دەستی بڕێ لە شوێنکەوتووانی کۆ کراونەتەوە ‹دین اسلام: دینی ئیسلام› ٢. کۆمەڵەی هۆکارە، بڕوا و کردەوەی کەسێک بۆ دامەزراندنی پێوەندیەکی باش لەگەڵ هێزگەلی ژوورە سروشتی و ڕاکێشانی یارمەتی و سەرنجیان.

▣ **دین اسلام** ☜ **اسلام**

**دین بودا** ☜ **بودائیّت**

**دین تائو** ☜ **تائوئیسم**

**دین زرتشت** ☜ **مَزدیَسنی**

**دین مسیح** ☜ **مَسیحیَّت**

**دین یهود** ☜ **یَهودیَّت**

**دینآور** / dînāvar، ـان/: صفت. دینهێنەر؛ دیناوەر؛ ناسێنەری دینێکی تازە.

**دینآوری** / dînāvarî، ـها/: اسم. دینهێنەری؛ دیناوەری؛ کار و ڕەوتی هێنانی دینێکی تازە کە هێما نەناسراوە.

**دینار** / dînār، ـها/: [یونانی از لاتینی] اسم. دینار؛ یەکەی پارەی تاقمێ ولاتان، وەکوو عیراق، کوەیت، بەحرەین و لیبی.

**دینام** / dînām، ـها/: [از فرانسوی] اسم. دینام؛ ژنراتۆر، بەتایبەت ژنراتوری بەرقی ڕاستەوخۆ.

**دینامومتر** / dînāmometr، ـها/: [فرانسوی] اسم. هێزپێو؛ ئامێرێ بۆ ئەندازەگرتنی هێزی میکانیکی.

**دینامیت** / dînāmît، ـها/: [فرانسوی] اسم. دینامیت؛ ماکێکی تەقەمەنی کە لە تی ئین تی و وردە ئاجۆر دروست دەبێ.

**دینامیسم** / dînāmîsm/: [فرانسوی] اسم. ١. ـ ها/ دینامیسم؛ هەر هزرێکی فەلسەفی کە دیاردەگەلی سروشتی (وەک ماک و بزووتن) بە هۆکاری هێزگەلی جیاواز دەزانێ ٢. بزێوی؛ جمە و جووڵە؛ جم و جووڵ؛ کرد و کۆش.

**دینامیک** [1] / dînāmîk/: [فرانسوی] اسم. دینامیک؛ لقێک لە زانستی میکانیک کە لە بارەی چۆنیەتی بزاڤی دەزگایەک لە ژێر کارتێکری هێزدا، بەتایبەت ئەو هێزانەی کە لە دەرەوەی دەزگاکەدان، دەکۆڵێتەوە.

**دینامیک** [2]: صفت. ١. بزۆز ٢. *[مجازی]* چالاک؛

کۆشا.

**دین‌باور** / dînbāvar ، ـان/: *صفت.* بـه دیـن؛ بـه بڕوا؛ به ئایین؛ ئاییندار. هەروەها: **دین‌باوری**

**دین‌پرور** / dînparvar ، ـان/: *صفت.* دین‌پەروەر؛ هۆی بەرەو پێش چوونی دین.

**دین‌پناه** / dînpanāh ، ـان/: *صفت.* دیـن‌پـارێز؛ پارێزەر و پشتیوانی دین.

**دیندار** / dîndār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* دینـدار؛ ئاییندار؛ بڕوامەند بە دیـن و پـێ‌داگـر لـە سـەر بەڕێوە بردنی داب و دەستووری دینی.

**دینداری** / dîndārî/: *اسم.* دینداری؛ ئاییندارى؛ دۆخ یان چۆنیەتی دیندار بوون.

**دینوسور** / dînosor/: [فرانسوی] ☜ **دایناسۆر**

**دیو**[1] / dîv ، ـها؛ ـان/: *اسم. [فرهنگ‌مردم]* دێو؛ درنج؛ دێولپا؛ دێوە؛ دیـو؛ دی: ١. بوونـەوەرێکی خەیالی لـە شـێوەی مرۆیـەکی زۆر ناشـیرین و ناحەز و زەبەلاح، زۆرتر بە شاخ و کلک و چنگی درێـژەوە ٢. *[مجـازی]* کەسـی ناخـار؛ نـاقۆلا؛ زەبەلاح؛ زەبـەلۆح؛ زلحـۆرت؛ زەپزەپـە؛ تـەژە؛ حۆل؛ حەیتە؛ زەلامـی درێـژی نالـەبار؛ نـاقۆلا و بــەوتەشـک ٣. *[مجـازی، قـدیمی]* ئەهریمــەن؛ شەیتان؛ هووت.

**دیو ـ**[2]: *پیشوازه.* دێو ـ ؛ زۆر ناشـیرین و پـیس ‹دیوسیما: دێوتەشک›.

**دیوآلبالو** / dîvālbālû ، ـها/: *اسم.* تەڤـری؛ دارشـرت؛ دار یـان دەوەنێـک لــە تـیرەی گوڵەسووران، کە خۆڕسک و لێڕەواریە.

**دیوار** / dîvār ، ـها/: *اسم.* دیوار: ١. دڤێر؛ دیڤەر؛ شۆرە؛ شوورە؛ سوور؛ شوورا؛ وارش؛ هەڵـچنراوی بڵند لە ئاجور یان هـەر شـتێکی‌تـر ٢. *[مجـازی]* لەمپـەر؛ پـەرچین؛ پـەرچین؛ پـەرژین؛ جـاخ؛ گەپل؛ بەرهەڵت.

▣ **دیوار به دیوار:** بانەوبان؛ شانەوشەو؛ دیوار بـە دیوار؛ دوو جێگای پێکەوە لکاو.

**دیوار سرد:** دیواری سارد؛ مەودای نێـوان دوو ئاو بە تینی جیاوازەوە.

▣ **دیوار صوتی را شکستن:** سەوت شـکاندن؛ بـە خێرایەک زۆرتر لە خێرایی دەنگ فڕین.

**دیوار کسی را کوتاه پیدا کـردن:** *[مجازی]* بـە کەسێ وێران؛ کەسێ بە بێ‌هێز و لاواز زانین.

**دیوار کشیدن:** دیوارکشی کردن ☜ **دیوارکشی**

**دیوار موش داشتن:** *[کنایی]* شۆفار تێدا هەبوون ‹مواظب حرف زدنت باش! دیوار موش دارد: هۆشـت بە دەمتەوە بێ! شوفارمان تیدایە›.

**از دیوار راست بالا رفتن:** *[کنـایی]* بـە دیـواری ڕاستا هەڵگەڕان؛ بە دەس و پاوە نەوێسان؛ لە کونی تفـەنگی شـەیتان دەرپـەڕین؛ چـەموو ماری بـەرئاردەی؛ یـەکجار بـزۆز بـوون ‹این بچه‌ها از دیوار راست بالا می‌روند: ئـەم منداڵانـە بـە دیواری ڕاستا هەڵدەگەڕێن›.

**از دیوار مردم بالا رفتن:** *[کنایی]* ماڵـی خەڵـک بڕین؛ دزی لە مەردم کردن.

**با دیوار حرف زدن:** *[کنایی]* لەگەڵ دیوار قسە کردن؛ لەگەڵ دار و بـەرد قـسەکردن؛ چـنی دیواری بیەی؛ گوێبیس نەبوون ‹مگـر مـن بـا دیوار حرف می‌زنم، چرا ساکتی؟: مەگەر لەگەڵ دیوار قسە دەکەم، بۆچی بێدەنگی؟›.

**دیواربست** / dîvārbast ، ـها/: *اسم.* کەڵـەک؛ شکەبەر؛ پاردە؛ دیوارێ کە بۆ بەرگری لـە ڕژانی خاک یان بەدیهێنانی ڕووپەڕێکی ساف و تەخت لە سەر بەرزاییدا دایدەنێن.

**دیوارپوش** / dîvārpûš ، ـهـا/: *اسـم.* دیوارپۆش؛ هەر کـام لـەو بەرهەمانـەی (وەکـوو کاغـەزدیواری، پارچـە و...) بـۆ داپۆشـینی ڕووی دیوار یان میچ.

**دیوارچینی** / dîvārčînî ، ـهـا/: *اسـم.* دیـوارچنی؛ دیـوار هەڵـچنی؛ دیـوار نیـان؛ کـاری چنـینی ئـاجور، بـەرد یـان بلـووک بـۆ دروست‌کردنی دیوار.

**دیوارکشی** / dîvārkešî ، ـها/: *اسم.* دیـوارچنی؛

کار و ڕەوتی دیوار نان.

**دیوارکوب** / dîvārkûb ، ـها/: *اسم.* پەردە و تەونێ کە بۆ ڕازاندنەوە بە دیوارەوە هەڵدەواسن.

**دیوارنگارە** / dîvārnegāre ، ـها/: *اسم.* نەخشەدیوار؛ نەققاشی دیواری؛ نەخشێک کە لە سەر دیوار دەیکێشن.

**دیوارە** / dîvāre ، ـها/: *اسم.* دیوارە: ١. ئەوەی وەک دیوار وایە ٢. قەورخە؛ قەدپاڵ؛ ڕووپەڕی کەناری شتێ ‹دیوارەی سد قشلاق: دیوارەی بەربەندی قشلاخ› ٣. *[زیست‌شناسی]* تێغە؛ سپین؛ زەمۆمە؛ ئەوەی کە دوو هلۆڵ یان چاوە لێک جیا دەکاتەوە.

**دیوال** / dîvāl ، ـها/: *اسم.* دیڤال؛ دیوارەیەکی ئەستوونی لە بەردەئاگرینە کە لە بەر بوونەوەی بەردە تواوەکان بەرەو تۆژی زەوی و سەرد و ڕەق بوونەوەیان بەدی‌دێ.

**دیوان** / dîvān ، ـها/: *اسم.* ١. *[دواوین]* دیوان؛ کۆمەڵە شیعری شاعیرێک ‹دیوان نالی؛ دیوان حافظ: دیوانی نالی؛ دیوانی حافیز› ٢. مەزرینگە؛ فەرمانگە؛ کارگێڕی ‹دیوان عالی کشور: مەزرینگەی بالای ولات› ٣. *[قدیمی]* کاناپە.

◘ **دیوان انشا:** *[قدیمی]* نفیسنگەی بەڕێوەبەرایەتی.

دیوان **بلخ:** *[کنایی]* دادگا یان مەزرینگەیەک کە کاری هیچ و پووچی تێدا دەکرێ و دادی ناڕەوا دەردەکەن.

دیوان دادرسی کشور: مەزرینگەی دادی ولات؛ بانترین سەردانگەی داد کە لێکدانەوەی بڕیاری دادگاکەل و شەڕ و هەرای دەوڵەتی وە ئەستۆیە: **دیوان کشور؛ دیوان عالی تمیز**

دیوان عالی تمیز ☜ **دیوان دادرسی کشور**

دیوان کشور ☜ **دیوان دادرسی کشور**

دیوان محاسبات: مەزرینگەی حەسابات؛ مەزرینگەیەک لە وەزارەتی دارایی کە گەیشتن بە حەسابگەلی دەوڵەتی وەئەستۆیە.

**دیوانسالاری** / dîvānsālārî/: *اسم.* دیوانسالاری؛ کاغەزبازی؛ بووروکراسی؛ نیزامی حکوومەتی کە داب و دەستووری کارگێڕی زنجیرەی پلە و پایەی تێدا بە توندی و زێدەڕۆیانە ڕەچاو دەکرێ.

**دیوانگور** / dîvāngûr/ ☜ انگور فرنگی، **انگور**

**دیوانگی** / dîvānegî ، ـها/: *اسم.* شێتی؛ شێتایەتی؛ لێوەیی؛ لێوەی؛ دێوانەیی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی دێوانە بوون ‹خودش را زدە بود بە دیوانگی: خۆی لە شێتی دابوو› ٢. *[مجازی]* کارگەلی نائاسایی و نەگونجاو ‹دیوانگی نکن! بە کارت ادامە بدە: شێتی مەکە! کارەکەت درێژە بدە› ٣. *[روان‌شناسی]* لێویاگی؛ لێواوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کەم بوونەوەی توانایی هزر و بیر بە هۆی گەزنی مێشک و دڵەوە.

**دیوانە**[1] / dîvāne ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* شێت؛ دێوانە؛ دیڤانە؛ دین؛ لێوە؛ لیڤە؛ لیوە؛ چڵ؛ هەردە؛ کەسێ کە بە هۆی ئازاردیتنی مێشک یان دڵیەوە، ئاکار و کردەوەی نائاساییە ‹دیوانە چو دیوانە بیند خوشش آید: شێت ئەگەر شێت ببینێ کەیفی سازە›.

◘ **دیوانەی زنجیری:** شێتی پەتبڕ؛ نەخۆشێکی ڕەوانی وا کە پێویستە هەمیشە چاوەدێری لێ بکرێ.

**دیوانە**[2]: *صفت.* شێت؛ دێوانە؛ دیلان؛ دیڤانە؛ دین؛ لێوە؛ لیڤە؛ لێڤە؛ لیوە؛ ئێست؛ هەردە: ١. بە ئاکاری نائاساییەوە ‹دختری دیوانە بە جوان بە آن خوبی جواب رد داد: کچە شێتە کوری بەو باشیەی جواب دا› ٢. تووش بووی تووڕەیی و دڵەڕەپێ زۆر ‹داشتم دیوانە می‌شدم: خەریک بوو شێت دەبووم› ٣. *[مجازی]* تووشیاری تاسەی زۆر ‹دیوانەی زنش بود: شێتی ژنەکەی بوو›.

**دیوانەخانە** / dîvānexāne ، ـها/: *اسم.*

شێتخانە؛ دینگە؛ جێگەی شێتان.

**دیوانەوار** / dîvānevār/: *قید.* شێتانە: ١. وەک شێتان ‹دیوانەوار خودش را بە در و دیوار می‌زد: شێتانە خۆی لە دار و بەرد دەدا› ٢. لە ڕادەبەدەر؛ دێوانەئاسا؛ زۆر زەبەند و سەرچلانە ‹او را دیوانەوار دوست داشت: لە ڕادەبەدەر خوشی دەویست›.

**دیوباد** / dîvbād، ـها/: *اسم.* گژەبا؛ باهۆز؛ بابەلیسک؛ بایەکی توند و خێرا کە خاک و خۆڵی زۆر هەڵدەستێنێ و دەبێتە هۆی لێڵ بوونی هەوا.

**دیوث** / dayyûs، ـها؛ ـان/: [عربی]*اسم.* دەییوس؛ دویت؛ دەویت؛ قورمساخ؛ گەواد؛ جاکەش؛ بێناموس: ١. کەسێ کە ژن (یان نزیکان)ی خۆی بە گرتنی پارە بۆ لای پیاوانی نامۆ دەبا ٢. پیاوێ کە یەکێ لە خزمانی نزیکی خراپکارە.

**دیوثی** / dayyûsî/: [عربی]*اسم.* دەییوسی؛ دەویتی؛ جاکەشی؛ قورمساخی؛ گەودای: ١. کار و پیشەی بێناموس ٢. دۆخی دەویت بوون.

**دیوخو** / dîvxû، ـیان/: *صفت.* دێوخۆ؛ خاوەن خۆی زۆر ناشیرین و نالەبار: **دیوخوی***[ادبی]*

**دیوخوی** / dîvxûy/ ☜ **دیوخو**

**دیود** / diyod، ـها/: [فرانسوی از انگلیسی]*اسم.* دیۆد؛ لامپی ئیلیکترونی بۆ یەکلاکردنەوەی ڕەوتی کارەبا.

**دیوراما** / diyorāmā/: [فرانسوی]*اسم.* دیۆراما؛ شانۆیێ کە بۆ دەربڕینی مەبەست لە پەردەی ناسک و ڕوون، پەیکەر، تیشک و دەنگ کەڵک وەردەگرێت.

**دیوسرشت** / dîvserešt، ـان/: *صفت.* دێوخدە؛ خاوەن ئاکار و کردەوەی ناحەز: **دیوسیرت**

**دیوسیرت** / dîvsîrat/: [فارسی/عربی] ☜ **دیوسرشت**

**دیوسیما** / dîvsîmā/: [فارسی/عربی] *صفت.* *[مجازی]* دێوسیما؛ بەوتەشک؛ خاوەن چڕ و چاوی زۆر ناشیرین و ناحەز.

**دیوکسید** / diyoksîd، ـها/: [فرانسوی]*اسم.* *[شیمی]* دی‌ئۆکسید؛ ئۆکسیدێک بریتی لە دوو ئەتومی ئۆکسیژن لە مولوکوولێکدا: **دی‌اکسید**

◘ **دیوکسید ازت** ☜ **دیوکسید نیتروژن**

**دیوکسید کربن**: دی‌ئۆکسیدی کەربون؛ گازی قورسی بێڕەنگ، گڕنەگر و هێندێک ژەهری کە لە ناتەوا سووتانی خەڵووز بەرهەم دێ و دە ژێر گوشاردا بە شێوەی تراو دەریدێنن: **گاز کربنیک**؛ **کربن‌دیوکسید**

**دیوکسید نیتروژن**: دیوکسیدی نیترۆژن؛ گازێ خورمایی ڕەنگ بە بۆنی تیژ و ناخۆشەوە کە لە بووژاندنەوە و لێکدانەوەی بڕێ نیتراتگەل بە تینی گەرماوە بەرهەمدێ: **دیوکسید ازت**؛ **نیتروژن اکسید**

**دیولاخ** / dîvlāx، ـها/: *اسم.* *[ادبی]* کونەدێو؛ کۆنەدێ؛ دێکۆن؛ جێگایەکی دوور لە ئاوەدانی، کە کەسی تێدا ناژی و هەبوونی دێوی دەخاتەوە بیری مرۆ.

**دیون** / diyon/: [عربی] جمعِ ☜ **دِین**

**دیه** / diye، ـها؛ دیات/: [عربی]*اسم.* ١. *[فقه]* دیە؛ تاوان؛ خوێنبایی؛ پارە یان ماڵێک کە تاوانکار دەبێ بە کەسێ کە گەزەنی پێگەیاندووە یان بە بنەماڵەکەی بدات ٢. *[قدیمی]* گوند؛ ئاوادی؛ دێ؛ لادێ.

**دیهیم** / deyhîm/: [یونانی]*اسم.* ١. *[گیاه شناسی]* جۆرێ گوڵی ڕازاوەیی بە هێشوو کە لە بنەوە درێژ بۆتەوە ٢. *[ادبی]* زەرزەنگ؛ تاج؛ تانج؛ تانجیک؛ تاژ؛ ناقسەرک؛ کولیلک؛ خەرمانە؛ کلاوی خەملاوی پاشایان کە بە زێڕ و زەنبەر ڕازاوەتەوە و لە سەری دەنێن.

# ذ

ذ / z/: حرف. نیشانەی پیتی یازدەهەم لە ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی کە لە زمانی عەرەبییەوە هاتووە و هەر وەک « ز » ئەخوێندرێتەوە.

ذ / ze/: اسم. زال؛ یازدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**ذائقه** / zā'eqe/: [عربی] ☜ **ذایقه**

**ذات** / zāt ، ـها؛ ذوات/: [عربی]/اسم. زات؛ خۆ؛ خود؛ هیم؛ سرشت؛ هەیەتی؛ ڕشتاڵە؛ گەوهەری سوروشتی هەر شتێک ‹بد ذات: بەد زات›.

**ذاتاً** / zātan/: [عربی]قید. هۆرا؛ لە خۆیدا؛ زاتەن ‹ذاتاً مرد بدی نیست: هورا پیاوێکی خراپ نیە›.

**ذات‌الجنب** / zātolcamb, -canb/: [عربی]/اسم. بەرەزام؛ سەتڵوجەم؛ ساتوورجەم؛ نەخۆشیەک کە یاو، کۆخە، چڵک و دژوار هەناسەدانی لەگەڵە.

**ذات‌الریه** / zātorriye/: [عربی]/اسم. دەردەسی؛ ژانەسی؛ پزوو؛ فرک؛ نەکسۆ؛ نەخۆشی پەز؛ نەخۆشی پەنەمان و چڵک کردنی سیپەلاک کە یاو، کۆخە و بەڵخی پێوەیە.

**ذات‌الکرسی** / zātolkorsî/: [عربی]/اسم. [نجوم] ئەستێرەی کۆ؛ پێروو؛ پیرۆ؛ وێنەیەکی گەردوونی دە ئاسمانی نیوەگۆی باکووریدا، بە شێوەی ژنێکی دانیشتوو لە سەر ئەسکەمل (سەندەڵی).

**ذاتی** / zātî/: [عربی] صفت. زاتی؛ خۆیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە زاتەوە ‹تمایل ذاتی به هنر داشت: هۆگرەتی زاتی بە هونەر بوو›.

**ذاکر** / zāker ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. زاکیر: ۱. زیکرکار؛ ویردخوێن ۲. [شیعه] ڕەوزەخوان؛ کەسێ کە دەرد و ڕەنجی بنەماڵەی پێغەمبەر دەڵێتەوە.

**ذال** / zāl/: [عربی]/اسم. زال؛ ناوی یازدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**ذایقه** / zāyeqe ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. چێژایی؛ چێژە؛ هەستێک کە گیانلەبەران بەوەوە تام و چێژە دەناسن ‹حس ذایقه: هەستی چێژایی› ۲. تامی دەم ‹این شیرینی را هم برای تغییر ذایقه بخورید: ئەم شیرینیەش بۆ گۆڕینی تامی دەم بخۆن› ۳. [مجازی] پەسند؛ سەلیقە، بەتایبەت لەمەڕ خواردەمەنیەوە ‹با ذایقەی من جور نیست: بە چێژەی من ناخوا› ✻ **ذائقه**

**ذبابه** / zobābe/: [عربی] ☜ **مگس ـ۱**

**ذبح** / zebh ، ـها/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی سەربڕین؛ سەرژێکرن؛ بەتایبەت سەربڕینی گیانلەبەرێک کە گۆشتی دەخورێ.

▣ **ذبح کردن**: ۱. سەر بڕین ۲. کوشتن؛

کوشتەی. هەروەها: **ذبح شدن**

**ذبیح** / zebîh ، ـها/: [عربی] *صفت*. ۱. سەربڕاو؛ سەربڕیاگ؛ سەرژێکراو ۲. قوربانی.

**ذخائر** / zaxā'er/: [عربی] ☜ **ذخایر**

**ذخایر** / zaxāyer/: [عربی] جمعِ ☜ **ذخیره: ذخائر**

**ذخیـره** / zaxîre ، ـهـا؛ ذخـایر/: [عربـی]/اسـم. پاشەکەوت؛ پاشـەکەفت؛ نەکـەپـووز؛ کوویـت: ۱. پاشمەنە؛ پەزمەندە؛ پەسمەنـدە؛ پەسمەنـە؛ پەزەمەنە؛ گردەوەکۆیی؛ نیاتە؛ ڤـەبوور؛ ئـەوەی کۆ کرابێتەوە ۲. ڤەبوور؛ پاشەکەوتی؛ گلـۆدراو؛ گلەودراو؛ پاشقل ۳. ئەوەی لـە کانگادایـە و بـۆ کەڵک وەرگرتن دەشێ ٤. کەسێ کە لە کـاتی شەڕدا بۆ ئەرتەش بانگ دەکرێ ٥. کەسێ کـە بۆ جێگری ئەندامی گرۆیەک (لـە کـاتی نـەبوون یان لاچوونیدا) ڕچاو کرابێ.

▣ **ذخیره شدن**: گردەوەکـۆ بـوون؛ پاشـکەوت بوون؛ پاشکەفت بوون.

**ذخیـره کـردن**: کۆکردنـەوە؛ پاشــقل‌دان؛ نیانەیەکـــەوە؛ هــەنۆتن؛ خــڕ قــەکرن؛ کـۆمکرن؛ جەمانـدن؛ ڤـەبوورین؛ گێڕانـەوە؛ پـاش خـستن؛ نیـایوە وریـو؛ پاشـەکەفت کردن؛ پاشەنازکردن.

**ذرات** / zarrāt/: [عربی] جمعِ ☜ **ذرّه**

**ذراریح** / zarārîh/: [عربی] ☜ روغـن ذراریـح، **روغن**

**ذراع** / zerā'/: [عربی] ☜ **ذَرع**

**ذرت** / zorrat ، ـها/: [عربی]/اسم. گەنمەشـامی؛ گەرمەشامی؛ گەرمەشانی؛ گەنم‌شامی؛ شـامی؛ گەنمە کابە؛ گولـەپێغەمبەرە؛ لازویـت؛ زەڕات؛ زوڕات؛ زوڕەت؛ زەڕاتـــە؛ کـــارس؛ گـــاڕس؛ سەرداری؛ گـەنمۆک؛ گەنەگەرچـەک؛ گـڵگڵ؛ دێمیلە: ۱. گیایـەکی ئـالیکی، یـەک سـالان و چاندنی بە گەلای زروی دریژ و دەنووک تیژەوە کە هێشووی گوڵەنێرینەی لە سەرەوەی لاسک و گوڵــەمێوینەی لــە دەور و بــەری گــەڵاوە دەردێ، دانــەی خــڕی سـفت و بریقـەدار بـە ڕەنگی سپی، زەرد یان قاوەیی ئامـاڵ سـووری هەیە ۲. دەنکی ئەو گیایە ❋ **زرّت**

**ذرع** / zar'/: [عربـی]/اسـم. زەرع؛ گـەز؛ گـەزە؛ یەکەی کۆنی پێوانی درێژایی، بەرانبەر بە ۱۰٤ سانتی‌میتر: **ذِراع**

▣ ذرع کـردن: میترکـردن؛ مترکـردن؛ گـەز کـــردن؛ گەزکـــەردەی؛ درێژایـــی شـــتێک پێوان.

ذرع نکرده پاره کـردن: *[کنایی]* بـێ‌فـوو لـە دۆکـــردن، خـــۆ تـــێ‌کوتـــان؛ بـــەبێ هەڵـــسەنگاندن کارێـــک‌کـــردن ‹گفـتم اول درست فکر کن، این طور ذرع نکرده پاره نکن!: وتم بـاش فیکـری لـێ‌وەکـە، بـێ فـوو لـە دۆکردن خۆتی تێ مەکوتە!›.

**ذروه** / zorve/: [عربـی]/اسـم. *[ادبـی]* ترۆپـک: ۱. دونـد؛ دون؛ لووتکـە؛ پۆپـە؛ قولـە؛ زەڕەوە ۲. سەراوان؛ دۆچک؛ تەشق؛ بـەرزترین خاڵـی هەر شتێک.

**ذره** / zarre ، ـها؛ ذرات/: [عربـی]/اسـم. ۱. نـون؛ زەڕە؛ وردیلـە؛ قـردگ؛ بەشـێکی زۆر ورد لـە ماکێک ۲. نون؛ زەڕە؛ وردیلـە؛ نیتـگ؛ نیتکـە؛ ماکی هەرە ورد ۳. گەردیلە؛ تۆزقـاڵ؛ تۆزکـاڵ؛ تۆز؛ چکێک؛ چکێ؛ هەندێکی زۆر هندک ‹یک ذره گرمتر است: تۆزقالێک گەرمترە›.

**ذره‌بین** / zarrebîn ، ـها/: [عربی/ فارسـی]/اسـم. هوورک‌بین؛ زەڕەبـین؛ ئـامرازێکی چـاوی کـە شتی چکۆلە لە بەر چاو زلتر دەکاتەوە.

**ذره‌بینـی** / zarrebînî/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. هوورک‌بینی؛ زەڕەبینی: ۱. هـەر شـتێکی زۆر ورد کـە بـەبێ زەڕەبـین نـابینـدرێت ۲. بـە تایبەتمەندی گەورەکردنەوەوە ‹عینـک ذره‌بینـی: چاویلکەی زەڕەبینی›.

**ذریه** / zorrîyye, zorriyye ، ـها/: [عربی]/اسم.

/ادبی/ منداڵ؛ مناڵ؛ مندار؛ زارۆ؛ زارۆچه؛ زارۆڵه؛ دووندان؛ تۆرەمە؛ بەرە؛ زار و زیچ.

▣ **ذریه‌ی رسول**: منداڵی پێغەمبەر؛ کەسێ کە لە تۆرەمەی پێغەمبەرە.

**ذغال** / zoqāl/ ☜ **زغال**

**ذق** / zoq/ ☜ **زق**

**ذکاوت** / zekāvat, zakāvat، ـها/: [عربی]/اسم. /ادبی/ زیرەکی؛ وریایی؛ وشیاری؛ هوشیاری؛ بیرتیژی؛ بیرتێژی.

**ذکر** / zakar/: [عربی]/اسم. /ادبی/ چووک؛ دم؛ سیرەت؛ کیر؛ کێر؛ ئەندامی زاوزێ گوهانداری نێر.

**ذکر** / zekr، ـها؛ أذکار/: [عربی]/اسم. ۱. بیرئانی؛ بیرەوەری؛ ویره ۲. زیکر؛ ویرد؛ نزای لە بن لێوانەوە.

▣ **ذکر خیر**: باشە؛ پەسنی پشتە سەر؛ ستایشی کەسێک لە نەبوونی خۆیدا.

**ذکر مصیبت**: ۱. کار یا ڕەوتی کلووزانە؛ کرووزانەوە؛ دەربڕینی دەرد و ڕەنج یان دژواری کارێک ۲. /شیعه/ باسی بەسەرهاتی دڵتەزێنی ئیمام حوسێن و یارانی.

▣ **ذکر شدن**: گوتران؛ وتران؛ واچیەی؛ کەوتنە بیر؛ وەبیرکەوتنەوە؛ کەفتنە بیر ‹نامی هم از او ذکر شد: ناوێکیش لەو گوترا›.

**ذکر کردن**: وتن؛ ناو بردن؛ یادکردن؛ گوتن؛ واتەی؛ بیر ئانینەوە؛ بیر هێنانەوە ‹این را هم ذکر کنید: ئەمەش بیژن›.

**ذکر گفتن**: زیکرکردن؛ دوعا کردن؛ پەیتاپەیتا نزا کردن و ویرد خوێندنەوە.

**ذکور** / zukûr, zokûr/: [عربی] صفت. کوڕ؛ نێر (زۆرتر لەمەڕ مرۆڤەوە) ‹فرزند ذکور: منداڵی نێر›.

**ذکی** / zakî/: [عربی] صفت. /ادبی/ وشیار؛ هوشیار؛ هۆشیار؛ وریا؛ زرنگ؛ زیرەک؛ زیخ؛ بەهۆش.

**ذلت** / zellat، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. زەبوونی؛ پەستی؛ ناکەسی ۲. بێچارەیی؛ بەستەزمانی؛ بەسەزوانی * **ذلیلی**

**ذله** / zelle/: [عربی] صفت. /گفتاری/ وەڕەز؛ وەڕەس؛ وەڕس؛ یاس؛ کەیل؛ تێداماو ‹از دستش ذله شده بودم: لە دەستی وەڕەز ببووم›: **زلّه**.

هەروەها: **ذله شدن؛ ذله کردن**

**ذلیل** / zalîl، ـها/: [عربی] صفت. زەبوون؛ زەلیل؛ پەست؛ کەساس؛ پچووک؛ سووک؛ چرووک.

**ذلیلی** / zalîlî/: [عربی] ☜ **ذلّت**

**ذم** / zam(m)، ـها/: [عربی]/اسم. لۆمە؛ سەرکۆنە؛ فڕ؛ خراپەبێژی؛ کار یان ڕەوتی خراپە گوتن و فڕ پێدادان.

**ذمت** / zemmat/: [عربی] ☜ **ذمّه**

**ذمه** / zemme/: [عربی]/اسم. /ادبی/ بەڵێن؛ پەیمان؛ نگرۆ؛ گفت؛ سۆز؛ بڕیار: **ذمّت**

▣ **بر ذمه گرفتن**: وەئەستۆگرتن؛ گرتنە گەردن؛ وەئەستۆگرتنی کار یان ئەرکێک لەمەڕ دیتریەوە.

**ذن** / zen/: [فرانسوی از ژاپنی]/اسم. زین؛ لە مەزهەبگەلی بوودایی کە تاکە ڕێبازی گەییشتن بە ڕاستەقانێ لە ڕێگەی بیرکردنەوە و تێڕوانینەوە دەزانێ.

**ذوات** / zavāt/: [عربی] جمعِ ☜ **ذات**

**ذوب** / zowb, zo:b، ـها/: [عربی]/اسم. ڕەوتی توانەوە؛ تاوینەوە؛ تاویانەوە؛ گۆڕانی ماکێکی خۆگر بە تراو بە هۆی گەرم بوونەوە.

▣ **ذوب فلز**: توانەوەی کانزا؛ جیا کردنەوەی کانزا لە بەردی کانگایی بە تواندنەوەی لە کوورەدا. هەروەها: **ذوب‌آهن؛ ذوب‌مس**

▣ **ذوب شدن**: توانەوە؛ تاوین؛ تاویان؛ تیوان؛ تاویانەوە؛ تاوینەوە؛ ئەوەتاویەی؛ تاویایوە؛ هەلیایش؛ هلمەیاسین؛ هەلیان؛ بوونە تراو. هەروەها: **ذوب کردن**

**ذوذنب** / zûzanab/: [عربی] ☜ ستارەی

دنباله‌دار، **ستاره**

**ذوزنقه** / zûzanaqe ، ـها/: [عربی]/اسم. زووزه‌نه‌قه؛ بیچمێکی چوارگۆشه‌ی ته‌خت که دوو پاڵی له یه‌ک ڕێژدان.

**ذوق** / zowq, zo:q/: [عربی]/اسم. زه‌وق: ۱. مه‌زاق؛ توانایی وه‌رگرتنی جوانی و چێژه‌ی شتێک ‹خیلی بی‌ذوق است: زۆر بێ‌زه‌وقه› ۲. چێژه؛ توانایی وێڕای هۆگره‌تی زۆر بۆ فێر بوون ‹ذوق هنری: زه‌وقی هونه‌ری› ۳. *[گفتاری]* خوه‌شحاڵی؛ وه‌شحاڵی؛ که‌یف‌خۆشی به بۆنه‌ی ڕووداوێکه‌وه ‹وقتی آزاد در کنکور قبول شد، پدرش خیلی ذوق کرد: کاتێ که ئازاد له کونکووردا سه‌رکه‌وت، بابی زۆر خۆشحاڵی کرد›.

▣ **ذوق کسی را کور کردن:** دڵی که‌سێک ساردکردنه‌وه؛ زه‌وقی که‌سێ کوشتن؛ که‌سێک له کارێک سارد و بێ‌هۆگره‌تی کردنه‌وه: **تو(ی) ذوق کسی زدن**

**تو ذوق زدن:** دانه ناو چاودا؛ ناحه‌ز نواندن ‹این رنگ قرمز خیلی تو ذوق می‌زند: ئه‌م ڕه‌نگه سووره زۆر ده‌داته ناو چاودا›.

**تو(ی) ذوق کسی زدن** ☜ **ذوق کسی را کور کردن**

**ذوقافیتین** / zûqāfîyateyn/: [عربی]/اسم. دووپاشڵ؛ دووبه‌شاوه‌ند؛ شیعرێک به دوو قافیه‌وه.

**ذوقزدگی** / zowqzadegî, zo:q-/: [عربی/ فارسی]/اسم. شاگه‌شکه‌یی؛ خۆشیه‌کی زۆر له ڕوودانی شتی زۆر خۆش و له‌نکاو.

**ذوقزده** / zowqzade, zo:q-/: [عربی/ فارسی] صفت. شاگه‌شکه؛ خاوه‌ن خۆشیه‌کی زۆر به بۆنه‌ی ڕووداوێکه‌وه ‹سارا خانم از دیدن پسرش ذوقزده شده بود و نمی‌توانست حرف بزند: سارا خان له دیتنی کوڕه‌که‌ی شاگه‌شکه بوو، نه‌یده‌توانی قسه بکات›. هه‌روه‌ها: **ذوقزده شدن؛ ذوقزده کردن**

**ذوقی** / zowqî, zo:qî/: [عربی] صفت. زه‌وقی: ۱. پێوه‌ندیدار یان هاوگه‌ر به کارێکی دڵخوازه‌وه که هۆی خۆشحاڵی و دڵخۆشیه ۲. پێوه‌ندیدار به هه‌ستی وه‌رگرتنی جوانیه‌وه ‹نقاشی یک کار ذوقی است: وێنه‌کێشی کارێکی زه‌وقیه›.

**ذهن** / zehn ، ـها؛ اذهان/: [عربی]/اسم. ۱. زه‌ین؛ سه‌رجه‌می ئه‌و هیمانه‌ی که له مێشکدا چالاکیگه‌لی وه‌ک هه‌ست، ئاوه‌ز، ویست، تێفکرین و... ده‌ڕه‌خسێنێ ‹امروز ذهن من خوب کار نمی‌کند: ئه‌وڕۆ زه‌ینم باش کار ناکات› ۲. بیر؛ ویر؛ هۆش؛ هزر؛ هرز؛ ئه‌و به‌شه‌ی مێشک که ئاوه‌ها کارگه‌لێکی وه‌ئه‌ستۆوه ‹نمی‌دانم در ذهن تو چه می‌گذرد: نازانم چی له سه‌رتدایه› ۳. *[مجازی]* به‌ر؛ بیر؛ ویر؛ حافزه؛ توانایی زه‌ینی بۆ بیر هێنانه‌وه یان دووپات‌کردنه‌وه‌ی شتانی فێربوو ‹ به ذهن بسپار!: له به‌ری که!›.

**ذهن‌گرایی** / zehngerāyî/: [عربی/ فارسی]/اسم. بیرڤانی؛ ئامۆژه‌یه‌ک که به‌رهه‌مگه‌لی زه‌ینی له چالاکیگه‌لی مێشک هاوێر ده‌کا: **اصالت ذهن**

**ذهنی** / zehnî ، ـها/: [عربی] صفت. ۱. زه‌ینی؛ بیری؛ هزری؛ هۆشی؛ پێوه‌ندیدار یان سه‌ر به زه‌ینه‌وه ۲. زه‌ینی؛ پێوه‌ندیدار به هێز و کاری مێشکه‌وه ‹حساب ذهنی: ژماردنی زه‌ینی› ۳. خه‌یاڵی؛ به‌رچاو هێنراو به بیر و خه‌یاڵه‌وه. به‌رانبه‌ر: **عینی**

**ذهنیت** / zehnîyyat ، ـها/: [عربی]/اسم. شێواز یان چه‌شنی بیرکردنه‌وه و تێفکرین، به‌تایبه‌ت له‌مه‌ڕ دادوه‌ری و هه‌ڵسه‌نگاندنه‌وه.

**ذهنی‌گرایی** / zehnîgerāyî/: [عربی/ فارسی] /اسم. ۱. ئامۆژه‌یێ که هه‌ر به به‌رهه‌مگه‌لی زه‌ینی بایه‌خ ده‌دا و ناسین به داهاتی ئاگایی زه‌ینی ده‌زانێ ۲. ئامۆژه‌یێ که به‌ده‌س‌هێنانی

ئەزموون یا هەستی زەینی (وەک لەزەت) بە باشترین شت دادەنێ و هەست و تێگەیشتنی هەر کەسێک بە ئەوپەڕی باشی و دروستی دەزانێ.

**ذی‌الحجه** / zilhacce, zelhacce/: [عربی] ☜ **ذیحَجّه**

**ذی‌القعده** / zilqa'de, zelqa'de/: [عربی] ☜ **ذیقعده**

**ذیحجـه** / zîhacce/: [عربـی]/اسـم. زیحەجـە؛ نەهەک؛ مـانگی قوربـان؛ مـانگی دوانزەهـەمی ساڵی کۆچی مانگی: **ذی‌الحجه**

**ذیحساب** / zîhesāb ، ـها؛ ـان/: [عربـی]/اسم. حەساوپشکێن؛ نوێنـەری وەزارەتی دارایـی لـە ڕێخراوەیەکی دەوڵەتیدا.

**ذیحسابی** / zîhesābî ، ـها/: [عربی]/اسم. لقێـک لە وەزارەتی دارایی لە ڕێخراوەیەکی دەوڵەتیدا کـە کـاری پـشکنینی حەسـاوگەلی ئـەو ڕێخراوەیە.

**ذی‌حـق** / zîhaq(q)/: [عربـی] صـفت.[ادبـی] حەقدار؛ بەحەق؛ خاوەن حەق ‹پدرم او را ذی‌حق نمی‌دانست: بابم ئەوی بە حەقدار نەدەزانی›.

**ذی‌حیات** / zîhayāt/: [عربـی] صـفت.[ادبـی] گیانلەبـەر؛ زینـدەوەر؛ گیانـدار؛ مـشەکەر؛ جووقەوار ‹هـیچ ذی‌حیـاتی در آنجـا دیـده نمـی‌شـد: گیانلەبەرێکیشی لێ نەدەبینرا›.

**ذی‌ربـط** / zîrabt/: [عربـی] صفت. پێوەندیـدار؛ پەیوەندیـدار؛ بەپێوەنـد لەگـەڵ بابـەتی ڕەچاوکراودا.

**ذی‌روح** / zîrûh/: [عربـی]/اسـم. گیانـدار؛ جانـەوەر؛ زینـدوو؛ زینـوو؛ زنی؛ بوونـەوەر؛ جووقەوار؛ جاندبەر؛ نزاوری.

**ذی‌شـعور** / zîšo'ûr/: [عربـی] صـفت.[ادبـی] مژیوەر؛ ئاوەزمەند؛ خاوەن فام؛ خـاوەن توانـای بیرکردنـەوە ‹هـیچ موجـود ذی‌شـعوری چنـین کـار نـسنجیده‌ای نمـی‌کنـد: هـیچ مژیوەرێـک کـاری وا ڕەمەکی ناکا›.

**ذی‌صلاحیت** / zîsalāhîyyat/: [عربـی] صـفت.[ادبـی] خـاوەنڕا؛ بەمـشوور ‹بایـد یـک مرجـع ذی‌صلاحیت بـه ایـن کـار رسـیدگی کنـد: پێویـستە شوێنێکی خاوەنڕا بەم کارە ڕابگا›.

**ذی‌علاقـه** / zî'alāqe/: [عربـی] صـفت.[ادبـی] خوازیار؛ خاوەن دڵخوازی، سەرنج یـان مافێـک لە ئاست شتێکدا ‹مؤسسات ذی‌علاقه می‌توانند با ما تمـاس بگیرنـد: ڕێخراوەگـەلی خوازیـار دەتـوان پێوەندیمان لەگەڵ بگرن›.

**ذیقعـده** / zîqa'de/: [عربـی]/اسـم. زیقەعـدە؛ ناڤجەژنان؛ مانگی نێوان شەشەکان و قوربـان؛ مـانگی یازدەهـەمی سالـی کـۆچی مـانگی: **ذی‌القعده**

**ذی‌قیمت** / zîqeymat, zîqîmat/: [عربی] صفت.[ادبی] هێژا؛ بەبایەخ؛ پڕبایەخ؛ بایەخدار؛ بـەنرخ؛ بەئـەرزش؛ هـەژی؛ کـوک؛ حـەلکی؛ باییـدار؛ هاولە؛ کاو ‹از خـدمات ذی‌قیمـت او بـه مـردم شـهر قدردانی شد: لە ڕاژەگەلی هێژای ئەو بۆ خەڵکی شار ڕێزگیرا›.

**ذیل** / zeyl/: [عربی]/اسم.[ادبی] ۱. خـوار؛ وار؛ خوارەوە؛ ژێر؛ پەین؛ داوێن ‹از صدر تـا ذیـل: لـە سەر تا خوار› ۲. ژێرەوە؛ ژێرۆ؛ خـوارەوە؛ خـوارۆ ‹در ذیل این نوشته بیان می‌شـود: لـە ژێـرەوەی ئـەم نووسـراوەدا دەگـوترێ› ۳. /ـهـا/ پاشـینە؛ نووسراوەیەک کە لە دووی نووسراوەیەکی‌تردا و بۆ تەواو کردنی هاتبێت.

**ذیلاً** / zeylan/: [عربی] قیـد.[ادبـی] لـە ژێـر؛ لـە خوار؛ لە ژێرەوە؛ لە خـوارەوە؛ وارەنـە؛ پەینەنـە ‹اسامی آنان ذیلاً ذکر مـی‌شـود: ناویـان لـە خـوارەوە دێ›.

**ذی‌نفع** / zînaf'/: [عربی] صفت. بەشدار؛ خـاوەن ماف؛ سەرقاڵ بە کارێک و بەهرەدار لە ئاکـامی ‹آزاد در آن کار ذی‌نفع بود: ئازاد لەو کارەدا بەشـدار بوو›.

# ر

**ر** / r/: *حرف.* نیشانەی دوازدەهەمین پیت لە ئەلفوبیتکەی زمانی فارسی.

**ر** / re/: *اسم.* ڕێ: ١. ناوی دوازدەهەم پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی ٢. *[موسیقی]* [فرانسوی] ناوی دووهەمین نوت لە گامی دیاتۆنیکدا.

**رآلیست** / re'ālîst، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* ڕیئالیست؛ لە سەر ڕێبازی ڕیئالیسم: **رئالیست**

**رآلیسم** / re'ālîsm/: [فرانسوی] *اسم.* ڕیئالیسم: ١. ئۆگرەتی و ئاوڕ دانەوە لە هەڵکەوتە و کار و باری گونجاو و بە دوور لە خەیاڵپەروەری ٢. ئامۆژەیەک کە جیهان بە هەڵکەوتەییێکی دەر لە زەینی مرۆ دەزانێ ٣. بڕوا بەوەی کە هەرچی بەهۆی بیر و هزرەوە دەناسرێت، خاوەنی هەبوونێکە لە جیهاندا ٤. ئەمەگداری لە سروشت یان ژیانی ڕاستەقینە و لێ ورد بوونەوەی بەبێ خەیاڵپەروەری.

**را**[1] / rā/: [عربی] *اسم.* ڕا؛ ناوی عەرەبی دوازدەهەمین پیتی ئەلفبێی فارسی.

**را**[2]: *حرف.* ١. نیشانەی بەرکاری بێ‌پێناو (مفعول بی‌واسطه)؛ لە کوردیدا نیشانەیەکی تایبەتی نیە بەڵام بۆ بێژگە لە مرۆ، لەگەڵ نیشانەی ناسیاویدا (معرفه) هاوڕێیە ‹کتاب را خریدم: کتێبەکەم کڕی› ٢. لەمەڕ؛ لەبارەی؛ دەربارەی؛ جەبارەو ‹علی را می‌گفت: لەمەڕ عەلیەوە دەیگوت› ٣. *[ادبی]* لەبارەی؛ دەربارەی؛ جێگری «بە»ی بەرکاری ‹دانایی را گفتند: بە زاناییێکیان گوت› ٤. *[ادبی]* لە؛ جە؛ نە؛ ژ؛ جێنشینی «از» ‹قضا را: لە چارەنووسدا› ٥. *[ادبی]* بۆ؛ پەی؛ ژبۆ؛ لەبەر؛ وەروو ‹خدا را: بۆ خودا›.

**راب** / rāb، ـها/: [؟] *اسم.* ڕاب؛ گیانەوەرێکی لەش‌نەرمە زۆر لە شەیتانۆکە دەکا.

**رابط** / rābet، ـها/: [عربی] *اسم.* پەیوەندیدەر: ١. ئەوەی دوو یان چەند شت پێکەوە پەیوەند دەدا ‹سیم رابط: سیمی پەیوەندیدەر› ٢. /ـان؛ ـین/ پەیوەندیکار؛ نێوانچی؛ بەریوان؛ کەسێ کە هۆی پەیوەندی نێوان خەڵک یان ڕێکخراوەیەکە ‹رابط میان دولت و مردم: پەیوەندیکاری نێوان دەوڵەت و خەڵک›.

**رابطه** / rābete، ـها؛ روابط/: [عربی] *اسم.* پەیوەندی: ١. نێوان؛ دۆخ یان چۆناوچۆنیەک کە دوو یا چەند شت یان بەش بە شتێک یان کارێکی ترەوە پەیوەند دەدا ‹رابطەی سیاسی: پەیوەندی سیاسی› ٢. بەرامبەری؛ فورموول؛ قانوون یان بنەمایەکی گشتی لە زانستی بیرکاریدا بۆ گەییشتن بە ئامانجێک دەگوترێتەوە ‹رابطەی نیوتن: فرموولی نیوتون› ٣. *[دستور]* ـیە؛ ـە؛ ـە؛ ـن؛ ـا؛ ـنە؛ وشەیێ کە «مسند» و «مسندالیه» پێکەوە پەیوەند دەدا ‹خدا

دانا است: خودا زانایە).

◙ رابطەی بازتابی/ انعکاسی: پەیوەندییەک لە کۆمەڵەیەکدا کە هەر کام لە بەشەکانی، پەیوەندەکەیان بگەڕێتەوە بۆ خۆیان.

رابطەی جنسی: تێکەڵاوی نێر و مێ؛ خلێنە و بلێنەیێ لە نێوان ژن و پیاودا کە بە تێکەڵ بوون و عیلاقە کردن بگا.

رابطەی زناشویی: پەیوەندی ژن و مێردایەتی؛ پەیوەندی نێوان ژن و شوو.

رابطەی سببی: خزمایەتییێک کە بە هۆی ژن و ژنخوازەوە پەیدا بووبێ.

رابطەی متقابل: پەیوەندی دووقۆڵی؛ پەیوەندی بارتەقایی؛ پەیوەندی نێوان دوو یان چەن لایەن بە شێوەیێک کە لە هەموو بارێکەوە وەک یەک بێنەوە.

رابطەی متقارن: پەیوەندی پابەپا؛ پەیوەند بە شێوەیێک کە هەر تاکێک لەگەڵ تاکێکیتردا پەیوەندی دووقۆڵی هەبێ.

**رابع** / rābe' /: [عربی] *صفت. [ادبی]* چوارەم ‹رکن رابع: بنەمای چوارەم›.

**رابعاً** / rābe'an /: [عربی] *قید. [ادبی]* چوارەم؛ لە چوارەمدا ‹رابعاً معلوم کنید مقدار آب مصرف شده را: چوارەم روون کەنەوە چ رادەیەک ئاو بەکار چووە›.

**رابی** / rābî /: *اسم.* رابی؛ سەرناوێکی ڕێزگرانە بۆ ناونانی دیناوەرانی جوولەکە و ئاشووری، بە واتای مامۆستا یان فێرکار.

**راپرت** / rāport ، ـها /: [فرانسوی] *اسم.* ۱. *[نامتداول]* گریبەند؛ سالۆخ؛ سالخ؛ راپۆرت؛ راپۆڕ؛ راژە گوتنەوەی ڕووداوێک ۲. *[کنایی]* کار یان ڕەوتی هایدان؛ خەبەر لێدان بە نووسین؛ هەواڵی کەسێک، ڕووداوی دانیشتنێ یان کۆڕێک، بە کەسێ یان شوێنێک دان.

◙ راپرت دادن: ۱. سالۆخ دان ۲. *[کنایی]* شۆفاری کردن؛ قسە هێنان و بردن؛ سیخوڕی کردن؛ دزنێرۆیی کردن.

**راپرتچی** / rāportčî ، ـها؛ ـان /: [فرانسوی/ ترکی] *اسم. [نامتداول]* ۱. هایدەر؛ سالۆخڤان ۲. سیخوڕ؛ شۆفار؛ دزنێرۆ؛ زیدەڤان؛ زیدەوان.

**راپسودی** / rāpsodî /: [فرانسوی] *اسم.* ڕاپسوودی؛ جۆرێک مووسیقای ڕۆژاوایی.

**راپید** / rāpîd /: [فرانسوی] ☜ **راپیدُوگراف**

**راپیدوگراف** / rāpîdog(e)rāf ، ـها /: [فرانسوی] *اسم.* ڕاپید؛ چەشنێ پێنووسی هێڵکێشان بە سەر قەڵەمی جۆراوجۆرەوە: **راپید**

**راتبه** / rātebe ، ـها /: [عربی] *اسم.* ڕاتبە؛ ڕاتوە؛ بوورس؛ مووچەی خوێندن.

**راتبه‌گیر** / rātebegîr ، ـان /: [عربی/ فارسی] *اسم.* مووچەخۆر؛ بوورسیە.

**راتیانج** / rātiyānc /: [معرب از یونانی] *اسم.* شرێز؛ چرێژ؛ کەتیرای داری کاج: **راتیانه**

**راتیانه** / rātiyāne /: [معرب از یونانی] ☜ **راتیانَج**

**راج** / rāc / ☜ **خاس**

**راجع** / rāce' /: [عربی] *اسم.* ۱. وەگەڕ؛ ئەواگێڵ؛ ڤەگەڕەوە ۲. *[موسیقی]* گۆشەیەک لە دەزگای نەوا و همایون.

◙ راجع به: سەبارەت بە؛ لەمەڕ؛ لەبارەی؛ دەربارەی؛ جەبارەو ‹نشستند و یک ساعت راجع به کار آزاد حرف زدند: دانیشتن و سەعاتێک سەبارەت بە کاری ئازاد قسەیان کرد›.

**راجعه** / rāce'e /: [عربی] ☜ تب راجعه، **تب**

**راجه** / rāce ، ـها /: [سنسکریت] *اسم. [قدیمی]* ڕاجە؛ نازناوی ئاغا و گەورەی خێڵ لە هێنددا.

**راجی** / rācî /: *اسم.* ڕاجی؛ هەر یەکە لە بنزاراوە جۆراوجۆرەکانی باوی زمانی فارسی لە ناوەندی ئێراندا (وەکوو کاشان، دلیجان و دێهاتەکانی دەوروبەری تاران).

**راحت**[1] / rāhat /: [عربی] *اسم. [ادبی]* ئاسوودەیی؛ هێسایی؛ ئاسایش؛ تەنایی؛ تەناهی؛ ڕاحەتی؛

ڕەحــەتی ‹اسباب راحت او هم فراهم شد: هۆی ئاسوودەیی ئەویش پێکهات›.

▣ **راحت جان:** *[ادبی]* ئارامی گیان؛ ئارامی دڵ؛ ڕاحەتی جەستە؛ ئارامی ژین؛ هۆی ئارامی و تەنایی گیان ‹راحت جان باش و باش!: ببە و ئارامی گیانم بە!›.

**راحت**[2]: *صفت.* ئاسوودە؛ ڕەحەت: ١. ڕاحەت ‹خواب راحت: خەوی ڕاحەت› ٢. خۆش؛ هۆی ئاسایش ‹جای راحت: جێگای ئاسوودە› ٣. ڕاحەت؛ ئاسوودەحاڵ؛ تەخت؛ دڵدامەزراو ‹در آنجا راحت است: لەوێ ئاسوودەیە› ٤. ئاسان؛ هاسان ‹کار راحت: کاری ئاسان›. هەروەها: **راحت بودن؛ راحت شدن؛ راحت کردن**

**راحت**[3]: *قید.* ئاسان؛ هاسان؛ بەئاسانی؛ ڕەحەت؛ بەڕاحەتی بەبێ سەختی و دژواری ‹راحت رفت توی سوراخ: ئاسان ڕۆیشتە ناو کونەکەوە›.

**راحت‌افزا** / rāhat'fzā/: [عربی/ فارسی] *صفت.* *[ادبی]* هەداگەشێن؛ ئاسایشدەر؛ هۆی زۆر بوونەوەی ئاسایش.

**راحت‌الحلقوم** / rāhatolholqûm، ـها/: [عربی] *اسم.* ڕەحەت؛ جۆرە شیرنیەکە لە نشاستە، شەکر و مزرەمەنی چێدەکرێ.

**راحت‌باش** / rāhatbāš/: [عربی/ فارسی] *اسم.* *[نظامی]* ١. فەرمانێ کە نیشانەی دوایی هاتن یان پشوودانێکی کورت لە ڕاهاتنی چەکداریدایە ٢. دۆخی وچان دان و حەسانەوە.

**راحت‌بخش** / rāhatbaxš/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ڕاحەتیدەر؛ ئارامبەخش.

**راحت‌طلب** / rāhat.talab، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* ئاسایشخواز؛ ئاسوودەییخواز؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە ئاسایشخوازی.

**راحت‌طلبی** / rāhat.talabî، ـها/: [عربی] *اسم.* ئاسایشخوازی؛ ئاسوودەخوازی؛ گرنگی دان بە ئاسایش و ڕاحەتی خۆ.

**راحتکده** / rāhatkade، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* *[ادبی]* پشووگە؛ هەداهۆ؛ شوێنێ (وەکوو ماڵ) کە کەسێ تێیدا هەست بە ڕەحەتی دەکا.

**راحتی**[1] / rāhatî/: [عربی] *اسم.* ئاسایش؛ ئاسوودەیی ‹راحتی من در رضایت شماست: ئاسایشی من لە ڕەزامەندی ئێوەدایە›.

**راحتی**[2]: *صفت.* ئاسوودە؛ ڕاحەت؛ هۆی ئاسایش ‹کفش راحتی: پێڵاوی ئاسوودە›.

**راد** / rād، ـان/: *صفت.* *[ادبی]* ١. جوامێر؛ پیاوچاک؛ مێرخاس؛ مێرخوز؛ دلێر؛ ئازا؛ گەڕناس ٢. دەسواز؛ بەخشندە ٣. زانا؛ ژیر.

**رادار** / rādār، ـها/: [فرانسوی از انگلیسی] *اسم.* ڕادار؛ دیارکەر؛ کەرەسەیەک بۆ دیاریکردنی جێی شتێ بە هۆی شەپۆلی ڕادیۆییەوە.

**رادع** / rāde'/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* لەمپەر؛ بەرهەڵست؛ چەت؛ بەرگر؛ پەرچەدەر؛ بەرپەرچدەر؛ گەپل؛ داردەست؛ ئەوەی لە کار یان ڕووداوێک بەرگیری بکا ‹در این راه هیچ مانع و رادعی نیست: لەم ڕێگەدا هیچ لەمپەر و کۆسپێک نیە›.

**رادمرد** / rādmard، ـان/: *صفت.* *[ادبی]* جوامێر؛ جۆمەرد؛ ئازا؛ خۆشمرۆ؛ کەڵەمێر؛ کەڵەپیاو؛ پیاویپیاو؛ ڕەند؛ مێرخاس؛ عەگید؛ پیاگخاس؛ خاوەن گەدی چاکی (وەک بەخشندەیی، خێرخوازی و بوێری و...).

**رادون** / rādon/: [فرانسوی] *اسم.* ڕادون؛ توخمێکی کیمیاوی ڕادیۆئەکتیڤ لە گرۆی گازە نایابەکان، بە ژمارەی ئەتومی ٨٦ و کێشی ئەتومی ٢٢٢: **نیتون**

**رادی** / rādî/: *اسم.* *[ادبی]* پیاوەتی؛ جوامێری؛ گەڕناسی.

**رادیاتور** / rādiyātor، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ڕادیاتۆر: ١. شۆفاژ؛ جۆرێ کەرەسەی گەرم کردنی ژوور بە کۆمەڵێ لوولە یا پەڕەی ناوخاڵی بۆ هاتوچووی ئاوی گەرم ٢. جۆرێ کەرەسەی فێنکەوکەری موتوری ماشین.

**رادیــان** / rādiyān/: [فرانسوی]/اسم. [ریاضی] ڕادیان؛ یەکەی پێوانی چەماوە و گۆشە بەرانبەری ۵۷ پلەک (دەرجە) و ۳۰ خولەک (دەقیقە).

**رادیس** / rādîs/: [؟]/اسم. [ریاضی] بنەما.

**رادیکال**[1] / rādîkāl ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ڕادیکاڵ: ۱. نیشانەیەک بە بیچمی √ کە ئەگەر ژمارەیێ دە ژێریدا جێبگرێ، پێویستە ڕیشەی (بە پێی هەندی دیاریکراو لە فورجەی ڕادیکاڵدا) بەدەست بێت ۲. ڕیشەی دیاریکراوی ژمارەیەک(²√ نیشانەی ڕیشەی دووهەم، ³√ نیشانەی ڕیشەی سێهەم و ⁿ√ نیشانەی ڕیشەی nهەمی هەندێکە): **ریشگی** ۳. [شیمی] بنەما؛ پێز.

**رادیکال**[2] / ـها/: صفت. [سیاست] ڕادیکاڵ: ۱. بنیاتخواز؛ لایەنگری گۆڕانکاری بنەمایی، شێواز یان پێکهاتگەل ‹حزب رادیکال: حیزبی رادیکال› ۲. توند و تیژ ‹نیروهای رادیکال: هێزە رادیکالەکان›.

**رادیکالیسم** / rādîkālîsm/: [فرانسوی]/اسم. [سیاست] ۱. بنیاتخوازی ۲. توند و تیژی.

**رادیم** / rādiyom/: [فرانسوی]/اسم. ڕادیوم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ بە ژمارەی ئەتومی ۸۸ و کێشی ئەتومی ۲۲۶،۰۲ کە کانزایەکی سپی و سەممی و بریقەدارە لە دەوا سازیدا بەکار دێ. لە هەڵوەشانەوەی ئەم توخمە ڕادۆن بەدی دێ.

**رادیو** / rād(i)yo/: [فرانسوی]/اسم. ڕادیۆ: ۱. ـها/ ئامرازی ڤەگری شەپۆلی دەنگی کە لە لایەن ئێزگەیێکەوە دەنێردرێن ‹یک رادیوی ۱۰ موج خریدم: رادیۆیێکی ۱۰ مەوجم کڕی› ۲. [مجازی] ئێزگەی ڕادیۆ ‹کودتاچیان رادیو را گرفتند: کودەتاچیەکان رادیۆیان گرت›.

**رادیوآکتیو** / rādiyoāktîv/: [فرانسوی] ☜ **پرتوزا**

**رادیوآکتیویته** / rādiyoāktîvîte/: [فرانسوی] ☜ **پرتوزایی**

**رادیوایزوتوپ** / rādiyoîzotop/: [فرانسوی]/اسم. ئیزوتۆپی ڕادیۆئەکتیڤ؛ ئیزوتۆپێک کە لە خۆیەوە تیشک ئەداتەوە.

**رادیوئی** / rād(i)yo'î/: [فرانسوی] ☜ **رادیویی**

**رادیوتراپی** / rādiyot(e)rāpî/: [فرانسوی]/اسم. تیشکدەرمانی.

**رادیوتلسکپ** / rādiyoteleskop/: [فرانسوی]/اسم. تلسکوپ رادیویی ☜ **تلسکوپ**

**رادیوساز** / rādiyosāz ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. ڕادیۆساز؛ چاکەوکەرەوەی ڕادیۆ.

**رادیوسازی** / rādiyosāzî/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. ڕادیۆسازی: ۱. کار یان ڕەوتی دروست کردنەوەی ڕادیۆ ۲. /ـها/ کارخانەی دروست کردنی ڕادیۆ ۳. /ـها/ کارگەی چاک کردنەوەی ڕادیۆ.

**رادیوسکپی** / rādiyoskopî/: [فرانسوی]/اسم. ڕادیۆسکۆپی؛ کاری چاو لە شتێک کردن (بەتایبەت ئەندامی نەخۆش) لە ڕێی بەدەسهێنانی وێنەیەک لە ئەو ئەندامە، بە کەرەسەی ڕادیۆگرافی.

**رادیوشیمی** / rādiyošîmî/: [فرانسوی]/اسم. ڕادیۆشیمی؛ لقێ لە زانستی شیمی کە لە ماک و دیاردەگەلی تیشکزا دەکۆڵێتەوە. هەروەها: **رادیوشیمیدان**

**رادیوضبط** / rādiyozabt ، ـها/: [فرانسوی/ عربی]/اسم. ڕادیۆزەبت؛ کەرەسەی ڕایۆ و تۆمارکەر و بلاوکەرەوەی نەواری کاسێت پێکەوە.

**رادیوگرافی** / rādiyog(e)rāfî/: [فرانسوی]/اسم. ڕادیۆگرافی؛ کار یان ڕەوتی وێنە بە دەسهێنان، بە هۆی کەرەسەی تاوێنەری تیشکی ئیکسەوە.

**رادیوگرام** / rādiyog(e)rām ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ڕادیۆگرام: ۱. کەرەسەی ڕادیۆ و گرامافۆن

غم رحمت آرید: دلاوایی‌ه‌ک بۆ ئەم گیانە پەرۆشە› ٢. بەخشندەیی؛ ڕەوتی لێ خۆش بوون ‹خداوند مردگان شما را رحمت کند: خودا لە مردووەکانتان خۆش بێ› ٣. دەهندەیی؛ دلۆڤانی ‹ابر رحمت: هەوری ڕەحمەت›.

◘ **رحمت کردن**: ڕەحمەت‌کردن: ١. دلۆڤانی کردن ٢. بەخشندەیی‌کردن؛ لێ‌خۆش بوون؛ داوا کردن لە خودا بۆ بەخشینی کەسێ ‹خدا مردگان شما را رحمت کند: خوا لە مردووەکانتان خۆش بێ› ٣. *[مجازی]* چاکە وتن؛ بە چاکی بیرکردنەوە؛ بە چاکە نێو بردن.

**به رحمت خدا پیوستن/ رفتن**: *[کنایی]* کۆچی دوایی کردن؛ ماڵاوایی کردن لە دنیا؛ بەر بەزەیی خوا کەوتن؛ مردن.

**رحیل** / rahîl/: [عربی] *اسم. [ادبی]* کۆچ؛ سەفەر؛ ڕەوگە؛ کۆچ‌وبار ‹عزم رحیل کردن: نیازی کوچ کردن›.

**رحیم** / rahîm/: [عربی] *صفت. [ادبی]* دلۆڤان؛ میهرەوان؛ دلۆڤانیکار؛ زۆر بەڕەحم ‹خداوند رحیم: خودای دلۆڤان›.

**رخ** / rax/: *اسم.* گاز؛ لەلە؛ کەلشت؛ هێڵ؛ کیڕ؛ شکەن؛ شوخت؛ دەرز؛ کێل؛ کێلە؛ ترەکە؛ هێڵێ کە بە سەر شتێکی ڕەقەوە (وەک بەرد یان ئاسن) بەدی‌دێ.

**رخ** / rox/: *اسم.* ١. ڕوخ؛ قەلعە؛ قەڵا؛ لە مۆرەکانی شەترەنجە کە بە شێوەی ئاسۆیی یا کۆڵەکەیی دەگەڕێ و هەر یاریکارێک لە سەرەتای کایەدا دوانی هەیە ٢. *[ادبی]* ڕوخ؛ ڕەخ؛ ئاڵ؛ لادیمە؛ هەر کام لە دوولای دەموچاو ٣. *[ادبی]* ڕوومەت؛ دەموچاو؛ ڕوخسار؛ چار؛ ڕوە؛ ڕوی ٤. *[ادبی]* گۆنا؛ سەرکوڵم.

◘ **رخ دادن**: ڕوودان؛ پێش‌هاتن ‹این واقعه در سال ٢١ هجری روی داد: ئەم کارەساتە لە ساڵی ٢١ی کۆچی ڕووی دا›.

**به رخ کشیدن**: ڕانان؛ کێشانە ڕوودا؛ نواندن؛ بە شێوازێکی ناڕاستەوخۆ، نیشانی دیتران دان ‹سه ماه رفته انگلیس، حالا که برگشته سواد انگلیسی‌اش را به رخ می‌کشد: سێ‌مانگ چووەتە ئینگلیس، ئێستە کە گەڕاوەتەوە سەوادی ئینگلیسی خۆی دەنوێنی›.

**رخام** / roxām/: [عربی] *اسم.* ١. مەیمەڕ؛ مەڕمەڕ؛ بەردی گەچی دانە ورد بە ڕەنگی سپی، ڕەگدار و ڕوون کە لە پەیکەرتاشی و کەل‌وپەلی تەوزێنیدا بەکاردێ ٢. *[قدیمی]* مەڕمەڕی سپی.

**رخبام** / roxbām/ ☜ **طرّه**

**رخپذیر** / raxpazîr/: *صفت. [کانی‌شناسی]* وەرقەهەڵگر؛ بە تایبەتمەندی شکان لە لایەکی دیاردا و بە شێوەی (کەم یان زۆر) ساف و ڕێک.

**رخت** / raxt ، ـها/: *اسم.* ١. جل‌وبەرگ؛ ڕەخت؛ گنج؛ پۆشاک؛ پۆشەمەنی؛ پۆشینە؛ پۆشنە؛ پۆشانە؛ بەرگ و شمەک؛ ئەوەی لە بەری دەکەن ‹رفتند برای خرید رخت عروسی: چوون بۆ کڕینی جل‌وبەرگی زەماوەند› ٢. *[قدیمی]* بەر و بوخچە؛ خستەک و ڕایەخ؛ پرتاڵ؛ شت‌ومەکی ڕاخراوەی نێوماڵ (وەک قاڵی و پێخەف).

◘ **رخت بربستن**: *[مجازی]* تیا چوون؛ مردن.

**رخت بستن**: *[ادبی]* بارکردن؛ کۆچ کردن؛ بارگە بردن؛ نەمان؛ نەمەنەی؛ ڕۆیین؛ تاران؛ وارگە چوون؛ لە بەین چوون یان بەرپیوار بوون ‹آرامش از خانه‌ی ما رخت بست: لە ماڵی ئێمە ئارا و قارا باری کرد›.

**رخت درآوردن**: *[گفتاری]* جل‌وبەرگ داکەندن؛ بەرگانە دەرهێنان؛ گنج دەرهێنان؛ جل‌وبەرگ لە بەر کەندن ‹رخشش را درآورد و لخت شد: جل و بەرگی داکەند و ڕووت بووەوە›.

**رخت‌آویز** / raxtāvîz ، ـها/: *اسم.* هەپە؛ مهین؛ چێولیباسی؛ کەرەسەی گنج هەڵاوەسین لە کاتی نەکرانە بەردا ‹شلوارت را آویزان کن بە

رخت‌اویز: شواڵه‌کەت بە هەیه‌کەدا هەڵواسە›.

**رختخواب** / raxtexāb ، ـها/:اسم. پێخەف؛ سەرناز؛ نڤین؛ نوین؛ سەرەخەر؛ بەخۆدادەر؛ جێگەوبان؛ جاگە؛ جل و جێوان؛ جل‌جێوان؛ بەستەک؛ دەستەنوێن؛ متێل؛ ڕەختخاو؛ یەتاخ؛ یاتاخ؛ پڕتاڵ؛ پڕتان؛ سەرجەمی ئەو کەرەسانە کە بە ڕووی نڤینگە یان زەویندا بۆ خەوتنی ڕادەخەن (وەک: دۆشەک، لێفە؛ پەتوو، سەرین و...).

▣ بە رختخواب رفتن: چوونە ناو جێگەوە؛ چوونە ناو نوێنەوە؛ چوونە سەر جێگەخەو؛ تەیار بوون بۆ خەوتن.

توی رختخواب افتادن: کەوتنە ناو جێوە؛ کەفتنە جێ؛ لە جێگەدا کەوتن؛ لاکەفتە بوون؛ نەخۆشی ناو جێ بوون ‹دو ماه توی رختخواب افتاده بود: دوومانگ کەوتبووە ناو جێوە›.

**رختخواب پیچ** / raxtexābpîč ، ـها/:اسم. مەوج؛ هەنجەڵ؛ قوماشێکی چوارگۆشە کە لە بڕێک ماڵاندا پێخەفەکانی پێ دەپێچنەوە و لە ڕۆژدا بە دیوارەوە هەڵی دەسپێرن.

**رختدار** / rax(t)dār ، ـها؛ ـان/:اسم. پێخەفدار؛ پڕتاندار؛ کەسێک کە لە دامەزراوەیەکی (وەک: هوتێل، نەخۆشخانە، سەربازخانە و...)دا ئەرکداری ڕاگرتن و ئاگەداری کردن لە پێخەف و پێخەفگەیە.

**رختدارخانه** / rax(t)dārxāne ، ـها/:اسم. پێخەفگە؛ پڕتانگە؛ هۆدەیەک لە دامەزراوەیەکدا (وەک: نەخۆشخانە، هوتێل، میوانخانە و...) کە پۆشانە و پێخەف لەوێ هەڵدەگیردرێ.

**رختشو** / raxtšû ، ـها؛ ـیان/:اسم. جلشۆر؛ بەرگشۆر؛ کۆلکەر؛ کولکەر؛ بالاڤکەر؛ کەسێک کە جلک و گنجی خەڵک بە پارە دەشوا.

**رختشوخانه** / raxtšûxāne ، ـها/:اسم. جلشۆرک؛ کەیەکی؛ شیووکوڵ؛ بالاڤ؛ ئەو جێگە جلکی لێ دەشۆن.

**رختشور** / raxtšûr ، ـها؛ ـان/:اسم. *[گفتاری]* جلشۆر؛ بەرگشۆر؛ کۆلکەر؛ کولکەر؛ بالاڤکەر؛ کەسێک کە جلک و کووتاڵی خەڵک بە پارە دەشوا.

**رختشورخانه** / raxtšûrxāne ، ـها/:اسم. *[گفتاری]* جلشۆرک؛ جلشۆرخانە؛ کوڵ؛ کەیەک؛ کەیەکی؛ شیووکوڵ؛ بالاڤ؛ ئۆدە یا سالۆنێ بە پێداویستی خۆیەوە بۆ جلک شۆردن.

**رختشوری** / raxtšûrî ، ـها/:اسم. *[گفتاری]* جلشۆری؛ کولکەری؛ بەراڤ؛ شیووکوڵ؛ بالاڤ؛ دراڤ؛ کوڵ؛ تمت‌وشۆ؛ شست‌وشۆ؛ بالاو؛ شوار.

**رختشویی** / raxtšûyî ، ـها/:اسم. بەراڤ؛ بالاڤ: ۱. کار یان ڕەوتی جل شتن ۲. شیووکوڵ؛ کاری جلشۆر ۳. *[گفتاری]* کەیەکی؛ شۆردنگە؛ جلشۆرخانە ٤. ماشینی جلشۆری * **رختشوری** *[گفتاری]*

**رختکن** / raxtkan ، ـها/:اسم. ۱. هۆدە یان جێگەیەکی سەرداپۆشراو بۆ لە بەرکەندن و گۆڕانی پۆشەمەنی ۲. هۆدەیەک کە کاتی چوونە ناوەوە، کڵاو و باڵتە و چەتر و...ی لێ ڕادەگرن.

**رخت و پخت** / raxt-o-paxt /:اسم. شت‌ومەک؛ شمەک؛ پڕتاڵ؛ کەل‌وپەل؛ کەلپەل؛ ماڵ؛ ناوماڵە؛ ناوماڵی.

**رخداد** / roxdād ، ـها/:اسم. ڕووداو؛ مەرسەلا.

**رخدیس** / roxdîs ، ـها/:اسم. ڕووپۆشەک؛ ماسک.

**رخسار** / roxsār ، ـها/:اسم. *[ادبی]* ڕوخسار؛ دیمەن؛ دیم؛ دیمە؛ ڕوو؛ ڕوە؛ ڕوی؛ چار؛ چارە؛ وێنە؛ تەتەڵە؛ گۆنە؛ دەموچاو؛ موور؛ سەحەت؛ ڕەنگ‌وڕوو ‹خوشا چشمی که رخسار تو بیند: خۆزگە بەو چاوە ڕوخسارت ببینێ›.

**رخساره** / roxsāre ، ـها/:اسم. ۱. ڕوو؛ ڕوە؛ ڕوی؛ دیم؛ دیمە؛ دیمەن؛ سەروچاو؛ دەموچاو؛ ڕوخسار؛ ڕوخسارە؛ چار؛ چارە؛ سیما؛ وێنە؛

تەتەڵە ‹دوش می‌آمد و رخساره برافروخته بود: رووی هەڵاییسابوو دویشەو کە دەهات› ۲. *[زمین‌شناسی]* کۆمەڵـە تایبەتمەندیگـەلی بنەنیشتێک لـە روانگـەی بەردناسـی، کۆنینەناسـی و هـەل و مەرجێک کە بۆتە هۆی بنەنیشتن.

**رخشان** / raxšān/: *صفت. [مخفف]* درەوشـان؛ درەوشاوە؛ گەشاوە؛ بریقەدار؛ گرشەدار؛ تەیسان؛ رەوشـەن؛ رۆشـن ‹خورشـید رخشان: هـەتاوی درەوشان›.

**رخشنده** / raxšande/: *صفت. [مخفف]* تیشکدەر؛ بـە درەوشـە؛ بریـسکەدەر؛ تروسـکەدەر؛ برووسکەدەر؛ بریکەدەر؛ بەتەیس؛ بریقەدەر ‹چو رخشنده مهتاب سر برنهد: کاتێ مانگی تیشکدەر سەر دەرێنێ›.

**رخصت** / roxsat/: [عربی]*/اسم. [ادبی]* بـەرایی؛ رێگانە؛ ئیجازە ‹رخصت خواستن: بەرایی خواستن›.

**رخنه** / rexne, raxne ،ـها/: *اسم.* ۱. رەهـۆڵ؛ دەرز؛ درز؛ کەلـشت؛ شـکەن؛ شـکێڕ؛ تریـشکە؛ قەڵش یـان چاکـێ لـە شـتێکدا کـە تـا نـاوەوە درێژەی هەیە ۲. کون؛ وڵە.

▣ **رخنه کردن**: دزەکردن؛ کـون کـردن؛ چوونـە نێو شتێ یـان شـوێنێکی بەسـتراوەوە ‹آب در دیـوار رخنـە کـردە بـود: ئـاو دزەی کردبـووە دیوارەکەوە›.

**رخوت** / rexvat,raxvat/: [عربی]*/اسم.* ۱. خاوی؛ سستی؛ تـەوەزەلی؛ تەپلمۆسـی؛ تەپـڵەمووسی ‹رخوت و تنبلی جز بـدبختی حاصلی نـدارد: سـستی و لەش‌گرانی بەدبەختی لە شوێنە و بەس› ۲. خاوی؛ کاسی؛ داهێـزراوی؛ کـەم‌هێـزی ‹بـە تـدریج دارو داشت اثر می‌کرد و وجودم دستخوش رخـوت مـی‌شـد: بـەرەـ بـەرە دەواکـە کـاری دەکـرد و خـاوی دایدەگرتم›.

**رد**[1] / rad(d)/: [عربی]*/اسم.* ۱. رەد؛ کـار یـان رەوتی دانـەوە؛ وەرگەڕاندنـەوە؛ گەڕاندنـەوە؛ وەرگێڕان ‹پول را بـە صـاحبش رد کـرد: پووڵـەکەی وەرگەڕاندەوە بۆ خاوەنی› ۲. رەد؛ رەت؛ کار یـان رەوتی قەبووڵ نەکردن و وەرنەگرتن ‹پیشنهاد او را رد کـرد: پێشنیارەکەی رەد کـردەوە› ۳. *[ـها]* شوێن؛ شوین؛ شۆن؛ شـوون؛ هەرونـە؛ هەرونـد؛ هەرون؛ هورەندە؛ شۆپ؛ شۆب؛ شـۆ؛ شـوێنەوار؛ ئاسەوار؛ شۆنەما؛ شۆنەمای؛ کەرخ؛ یافت؛ رێـنج؛ نونـگ؛ رەت ‹رد صـدا؛ رد پـا؛ رد کـسی را گـرفتن: شوینـی دەنـگ؛ شـوین پـا؛ شوینـی کەسـێ هەڵـکردن› ٤. تێپـەڕ؛ رەد؛ کـار یـان رەوتی تێپەڕین لە شوێنێکدا ‹کسی از اینجا رد نشده است: کەسێک لێرەوە تێپەڕی نەکردووە›.

▣ **رد شدن**: ۱. رەد بوونـەوە؛ قـەبووڵ نـەبوون؛ وەرنەگیریان ۲. تێپەڕین؛ رەد بـوون؛ بـوردن؛ ویەردەی؛ پەڕینەوە؛ ڕابواردن؛ پڕایوە ‹از خیابان رد مـی‌شـدم کـە بـا ماشـین تـصادف کـردم: لـە شەقامەکەوە تێدەپەڕیم، کە ماشێن لێی‌دام›.

**رد کردن**: ۱. دانەوە؛ پێ‌دانـەوە؛ گەڕاندنـەوە؛ دایـوە؛ ئەوەگێـڵنەی ۲. سـپاردن؛ دانـە کەسێ‌تر؛ پـڕنایوە؛ ئەوەپڕنـەی ۳. رەدکـردن؛ تێپەڕاندن ٤. رەدکردنەوە؛ وەر نەگرتن؛ پەسند نەکردن؛ هەڵخووشان؛ لا داین؛ دانە دواوە.

**رد کـسی را پیـدا کـردن**: شـوێنی کەسـێ دۆزینەوە؛ شوێن کەسێ هەڵکردن؛ شۆنۆ یۆی هۆرکـەردەی؛ هـەواڵ یـان نیـشانەیەک لـە جێگەی کەسێ بەدەس‌هێنان.

**رد کسی را گرفتن**: بـە شـوێن/ لـە شـوێنەوار کەسێکدا چوون؛ شوێن کەسێ گرتن؛ کەوتنە شوێنی کەسێک؛ رێنجی کەسێ دانـە پـەی؛ شۆنەماو یۆیرە گێڵەی ‹بۆ کەوتنە شـوێنی یـان دۆزینەوەی›.

**رد**[2]: *صـفت. [گفتـاری]* سـەرنەکەوتوو؛ رەد؛ قەبووڵ‌نەبووگ؛ وەرنەگیراو ‹آزاد از امتحان رد شد: ئازاد لە ئەزموونەکەدا سەر نەکەوت›.

**ردا** / radā, redā ،ـها/: [عربی]*/اسم. [قدیمی]* بالاپۆش؛ عاپا؛ عابا؛ بـەرگێکی شـۆڕ و ئاودامـانی

بەرواز و بێقۆپچە کە لە سەر جل‌وبەرگی تری دەکەن.

**ردخور** / radxor/: [عربی/ فارسی] *صفت. [گفتاری]* وەرنەگیراو؛ شیاوی ڕەدکردنەوە.

▣ **ردخور نداشتن**: بێ سێ‌ودوو بوون؛ تەواو بوون؛ بێ کەمایەسی بوون؛ وەرگیرانی بێ قسەوباس ‹حرفهایش ردخور نداشت: قسەکانی بێ سێ‌ودوو بوو›.

**رده** / rade ، ـها/: *اسم.* ١. ڕیز؛ ڕێز؛ ڕیزە؛ ڕێزە؛ ڕزن؛ پێرە؛ چینە؛ سەف؛ ڕەج ٢. *[زیست‌شناسی]* لە یەکەگەلی ڕزن کردنی گیانەوەران و گیاگەل، بریتی لە چەند ڕاستە، کە خۆی بەشێکە لە لقێک.

**رده‌بندی** / radebandî ، ـها/: *اسم.* ڕیزبەندی؛ ڕیزگری؛ کار و ڕەوتی مریس‌کردنی شتان لە ڕیزە و دەستە یان گرۆگەلدا بە پێی تایبەتمەندیان.

**ردی** / raddî ، ـها/: [عربی] *اسم.* ڕفووزەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرنەکەوتن. بەرانبەر: **قبولی**

**ردیاب** / radyāb ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* شۆپ‌هەلگر؛ شۆپاژۆ؛ شۆپگەر؛ شوێن‌هەلگر؛ هەرند؛ شوێن‌گیر؛ کەسێک یان کەرەسەیێ کە بەرەوگەی ڕۆیشتن یا شوێنی کەسێ یان شتێ دەدۆزێتەوە. هەروەها: **ردیابی**

**ردیز** / radeîz ، ـها/: [؟] *اسم. [زیست‌شناسی]* ژێرڕیزە؛ بەشێکی جیاواز لە ڕیزێک.

**ردیف** / radîf ، ـها/: [عربی] *اسم.* ١. ڕیز؛ ڕز؛ ڕزن؛ ڕزگ؛ کەسان یان شتانێ کە لە پاڵ یان لە پشتەسەری یەکتریدان ‹آنها در دو ردیف پشت سر هم نشسته بودند: ئەوان لە دوو ریزدا پشتەسەری یەک دانیشتبوون› ٢. ڕیز؛ پێرە؛ ڕێز؛ ڕز؛ ڕزن؛ قەتار؛ ڕقات؛ هێلێ کە بەم جۆرە دروست دەبێ ‹نفر وسط از ردیف سوم: نەفەری ناوەڕاست لە ریزی سێهەم› ٣. وشە یان وشەگەلێ کە لە دوایی هەموو دێڕگەلی شیعرەوە دێ و دووپاتە دەبێتەوە (وەک وشەی «بێ‌تو» لە کۆتایی دێڕەکانی ئەم بەیتە شیعرەی نالیدا «نەمردم من ئەگەر ئەمجارە بێ‌تۆ/ نەچم شەرت بێ هەتا ئەم خوارە بێ تۆ») ٤. *[موسیقی]* چۆنیەتی شوێن یەک کەوتنی گۆشەگەل لە دەزگای مووسیقی ئێرانیدا.

**ردیفی** / radîfî/: [عربی] *قید.* بە ڕیز؛ ڕێزی؛ ڕزی؛ بە بیچمی ڕیزەوە ‹ردیفی نشسته بودند: بە ڕیز دانیشتبوون›.

**ردیم** / rod(i)yom/: [فرانسوی] *اسم.* ڕادیۆم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٤٥ و کێشی ئەتومی ١٠٢,٩٠ بە ڕەنگی سپی، نەرم و بیچمگر، لە ناو ئاو ناتوێتەوە و لە هەمبەری ئەسیدەوە خۆگرە، لەگەڵ کانیگەلی پلاتیندا هەیە و لە ئاوکاری، ئالیاژسازی و شەمەکی ئەندازەگری ئەستێرەوانیدا بەکەڵکە: **رُودیُم**

**رذائل** / razā'el/: [عربی] ☜ **رذایل**

**رذالت** / rezālat, razālat ، ـها/: [عربی] *اسم.* پەستی؛ خوێڕیەتی؛ ناکەسی؛ چەپەڵی؛ تەرەسی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی پەست بوون ‹تو به این رذالت تن دادی که بچه‌هایت را به گدایی ببری؟: تۆ خۆت دا لە قەرەی ئەم پەستیە کە منداڵەکانت بەری بۆ سواڵکەری؟›.

**رذایل** / razāyel/: [عربی] جمعِ ☜ **رَذیلَت: رذائل**

**رذل** / razl ، ـها/: [عربی] *صفت.* پەست؛ خوێڕی؛ خۆڕی؛ تەرەس؛ ناکەس؛ گەمار ‹آدم باید خیلی رذل باشد، که از حق هم‌کیش خود بدزدد: مرۆ دەبێ زۆر پەست بێت، کە لە مافی هەڤاڵی خۆی دزی‌کات›.

**رذیلانه** / razîlāne/: [عربی/ فارسی] *قید.* بە پەستی؛ پەستانە؛ خوێڕیانە؛ پیسانە ‹در دوران جنگ خیلی رذیلانه برخورد می‌کرد: لە سەردەمی شەڕدا زۆر بە پەستی دەجووڵاوە›.

**رذیلت** / razîlat ، ـها؛ رذایل/: [عربی] *اسم.* خوێڕیەتی؛ پیسیەتی؛ گەماریەتی.

**رز** / raz ، ـان/: *اسم.* میّو؛ مەیڤ؛ ڕەز؛ داری ترێ؛

داری هەنگوور: مُو

**رز** / roz/: [فرانسوی] ☜ گل سرخ، **گل**

**رزاز** / razzāz ،ـها؛ـان/: [عربی]/اسم. ١. برنج‌کوت ٢. کەسێ کە کاری فرۆشتنی برنج و بڕوێش و دانەوێڵەیە.

**رزازی** / razzāzî/: [عربی]/اسم. ١. کڕینگەی برنج؛ دووکانی برینج‌فرۆشی ٢. کاری فرۆشتنی برنج و دانەوێڵە.

**رزاق** / razzāq/: [عربی] صفت. [ادبی] ڕۆژیدەر؛ ڕۆزیدەر؛ بژیودەر.

**رزبان** / razbān ، ـها؛ ـان/: اسم. ڕەزوان؛ ڕەزڤان؛ باخەوانی باخی ترێ.

**رزرو** / rezerv/: [فرانسوی]/اسم. دابین؛ ئەوەی ڕەچاوکراوە تا جێگرەوەی کەسێ یان شتێکی‌تر بێ ‹از حالا برام توی هتل جا رزرو کردەاند: هەر لە ئێستاوە لە ئوتێلدا جێیان بۆ دابین کردووم›.

هەروەها: **رزرو بودن؛ رزرو شدن؛ رزرو کردن**

**رزق** / rezq ، ارزاق/: [عربی]/اسم. بژیو؛ ڕۆژی؛ نان‌وسۆل؛ نان‌وخوێ؛ ڕزق ‹رزق آدم را خدا می‌دهد: بژیوی مرۆ لە لای خوایە›.

**رزم** / razm ، ـها/: اسم. [ادبی] شەڕ؛ جەنگ ‹جامەی رزم بر تن کرد: بەرگی شەڕی کردە بەر›.

**رزم آزموده** / razmāz(e)mûde/: صفت. [ادبی] شەڕدیتوو؛ شەڕچەشتە؛ ڕەزمازما؛ خاوەن ئەزموون لە شەڕدا.

**رزم‌آور** / razmāvar ، ـان/: صفت. [ادبی] جەنگاوەر؛ سەفدەر؛ جەنگی؛ نەبەز؛ شەڕانی؛ شەڕۆر؛ شەڕاوی؛ ئازا لە شەڕدا ‹مرد رزم‌آور: پیاوی جەنگاوەر›.

**رزمایش** / razmāyeš ، ـها/: اسم. ڕۆنانگەی جەنگ؛ خەبات و چالاکی پۆڕدراوێ بە بەشداری کەسان و کەرەسەگەلی پێویست بۆ تاوتوێ‌کردن، دابین‌کردن یان نمایشدانی بەرهەڤی بۆ شەڕ.

**رزمجو** / razmcû ، ـها؛ ـیان/: صفت. [ادبی] جەنگەرانی؛ جەنگەران؛ شەڕویست؛ جەنگکەر؛ شەڕچی؛ شەڕانی؛ جەنگاوەر؛ جەنگی ‹مرد رزمجو: پیاوی جەنگەرانی›.

**رزمدیده** / razmdîde ، ـگان/: صفت. [ادبی] شەڕدیتوو؛ شەرئازما.

**رزمگاه** / razmgāh ، ـها/: اسم. [ادبی] شەڕگە؛ هێلگە؛ مەیدانی جەنگ.

**رزمنامه** / razmnāme ، ـها/: اسم. شەڕنامە؛ کتێب و پەرتووکێ کە لە بابەت شەڕەوە نووسراوە.

**رزمناو** / razmnāv ، ـها/: اسم. کەشتی جەنگی.

**رزمنده** / razmande ، ـها؛ ـگان/: صفت. [ادبی] شەڕکەر؛ بەشەڕ؛ خاوەن هێزی شەڕکردن ‹نیروی رزمنده: هێزی شەڕکەر›.

**رزمی** / razmî/: صفت. [ادبی] جەنگی؛ شەڕەکی؛ شەڕی؛ پێوەندیدار بە شەڕەوە.

**رزمیدن** / razmîdan/: مصدر. لازم. [ادبی] // **رزمیدی**: شەڕت کرد؛ **می‌رزمی**: شەڕ دەکەی؛ **بِرزم**: شەڕ بکە// شەڕکردن؛ گژیەی؛ جەنگین؛ بەرزاندن؛ بەلشین.

■ صفت فاعلی: **رزمنده** (شەڕکەر)/ صفت مفعولی: **رزمیده** (ـ)/ مصدر منفی: **نَرزمیدن** (شەڕ نەکردن)

**رزوه** / rezve, razve ، ـها/: اسم. رزوه: ١. گیرە؛ ئالقەیەک کە سەری زافتەکە دەکەوێتە ناوی و قفڵەکەی لێ دەخەن: **رَزه** ٢. دەندەی پێچاوپێچ؛ شاشە (وەک دەندەی پێچ).

**رزه** / raze/: [؟] ☜ **رزوه ـ ١**

**رزیدن** / razîdan/: مصدر. متعدی. [قدیمی] // **رزیدی**: ڕەشتت؛ **می‌رزی**: دەڕێژی؛ **بِرز**: بڕێژە// ڕەژتن؛ ڕشتن؛ ڕژتن؛ ڕەشتەی؛ گۆنانەدن؛ ڕەنگاندن؛ ڕەنگ کردن.

■ صفت فاعلی: **رزنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **رزیده** (ڕەژیاگ)/ مصدر منفی: **نرزیدن** (نەڕەژتن)

**رزیدنت** / rezîdent ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ڕێزیدێنت؛ بژیشکێ کە بۆ تێپەڕکردنی دەورەی پسپۆڕی لە نەخۆشخانەدایە.

**رزیستانس** / rezîtāns/: [فرانسوی]/اسم. [برق] ڕێزیستانس؛ باشار؛ بەرگری؛ مقاوەمەت.

**رزین** / rezîn ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] ڕزین؛ هەر یەکە لە تەنگەلی نەگۆڕ یان نیمچە نەگۆڕی بێبیچم و ئاگرگر بە ڕەنگی زەردی ئامال قاوەیی کە لە دەلاندنی برێ گیاوە پێکدێ.

**رژ** / roj/: [فرانسوی] ☜ **رُوژ**

**رژه** / reje ، ـها/: اسم. سان؛ ڕێژە؛ ڕێوڕەسمی مەشقی گرۆیەک بۆ بۆنەیەکی فەرمیەوە (جێژن یان دیمانەی کەسایەتیەک) لە ڕیزگەلێکی تەکووزدا لە بەرانبەر کەس یان شتێکەوە.

▣ رژه رفتن: وەتەرنایش؛ ڕێژە چوون؛ تێپەڕ بوونی ڕیزگەلێ لە کەسانی دەستەیەک لە بەرانبەری کەسێک یان شتێکەوە.

**رژیسور** / rejîsor ، ـها/: [عربی]/اسم. ڕیژیسۆر؛ دەرهێنەری شانۆ.

**رژیم** / rejîm ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ڕژیم: ۱. دوزەنە (بەتایبەت دوزەنەی سیاسی)؛ دام و دەزگای دەسەلات ‹رژیم جمهوری: ڕژیمی کۆماری› ۲. دەولەت یان دەسەلات ‹رژیم اسرائیل: ڕژیمی ئیسراییل› ۳. پاریز؛ پاریزانە؛ ڕینامەیەکی دیاریکراو بۆ نەخواردن و خواردنی چەشنێ خواردەمەنی ‹من رژیم دارم، شام نمی‌خورم: ئەمن پاریز دەکەم، شێو ناخۆم›.

▣ رژیم گرفتن: ڕژیم گرتن؛ پاریزکردن؛ لە ڕێنامەیەکی تایبەتی بۆ خواردن و نەخواردن کەلک وەرگرتن. هەروەها: **رژیم داشتن**

**ـ رس** / res, ras/: پیوازه. ـ ڕەس: ۱. ئەوەی کە بگا؛ ڕەسندە ‹نورس: تازەڕەس› ۲. جێگەیێ کە بگری پێی بگەی ‹دسترس: دەسڕەس› ۳. پێڕاگەیێن ‹دادرس: فریاڕەس›.

**رس** / ra(o)s/: صفت. هەڤدەلووش؛ چلێس؛ زکن؛ زکین؛ بخوارە؛ زککوور؛ زکوون؛ بەرچاو برسی؛ سکەڕۆ؛ سکن؛ چەورە.

**رس** / ros/: اسم. ڕس؛ خاکەسوورە: **رُست**

▣ رس آهکی: ڕسی قسلی؛ خاکەسوورەی تێکەلاو لەگەل قسلدا. هەروەها: **رس ماسه‌ای؛ رس آهنی**

رس چربی‌زدا: جۆرێک خاکی ڕسی دانەڕێزی سروشتی، بەهێزی هەلمژانی زۆرەوە، کە بۆ سرینەوەی ڕەنگ کەلکی لێ دەگرن.

رس نسوز: ڕسی نەسۆچ؛ جۆرێ خاکەسوورە کە لە بەرامبەر گەرمای زۆرەوە باشاری دەکا و بیچمی ناگۆڕدرێ.

**رسا** / rasā, resā/: صفت. ڕەسا؛ ڕزگ؛ هەراش؛ خاوەن چەندیەتی یان چۆنیەتی تەواو یان دلخواز ‹صدای رسا: دەنگی ڕەسا›.

**رسائل** / rasā'el/: [عربی] ☜ **رسایل**

**رسائی** / rasā'î, resā'î/ ☜ **رسایی**

**رسالات** / resālāt/: [عربی] جمعِ ☜ **رساله**

**رسالت** / resālat/: [عربی]/اسم. ۱. پێغەمبەری؛ پەیامنێری ‹پیغمبر اسلام یازده سال پیش از هجرت به مدینه، به رسالت رسید: پێغەمبەری ئیسلام یازدەسال پێش کۆچی بۆ مەدینە، بوو بە پێغەمبەر› ۲. /ـها/ ئەرکێکی دەروونی و سەرەکی کە کەس بۆ بەڕێوەبردنی، خۆی بە بەرپرس بزانێ ۳. کار یان ڕەوتی تێگەیاندن و پێگەیاندنی پەیام.

**رساله** / resāle ، ـها؛ رسالات؛ رَسایل/: [عربی]/اسم. نامیلکە؛ نامە؛ سیپارە؛ کتێبۆکە: ۱. وتارێکی تێروتەسەل یان کتێبێکی چکۆلە لەمەڕ بابەتێکی زانستیانەوە، بەتایبەت ئەوەی کە لە قۆناغگەلی زانستگاییدا دەبێ لە لایەن خوێندکارانەوە بنووسرێت ۲. فتوا و بڕیارگەلی شەرعی کە دیناوەرێکی شەرعی دەیدا.

**رسام** / rassām/: [عربی]/اسم. ۱. /ـها/ ئامرازی ڕەسم کردن؛ کەرەسەیێ کە بکرێ شتێکی پێ ڕەسم بکەی ۲. /ـان/ کەسێ کە کاری کێشان و ڕەسم کردن بێت.

**ـ رسان** / resān, rasān/: پیوازه. ـ بەر؛ ـگەیێن؛ ـ یاون؛ گەیێنەر ‹نامەرسان: نامەگەیێن›.

**رسانا** / resānā, rasānā/: *صفت.* ڕەسانا؛ بە تایبەتمەندی ڕاگوێزانی کارەبا، هەوا یان دەنگەوە. هەروەها: **رسانایی**

**رساندن** / resāndan, rasāndan/: *مصدر. متعدی.* // **رساندی:** گەیاندت؛ **می رسانی:** دەگەیێنی؛ **برسان:** بگەیێنە// گەیاندن؛ گەهاندن؛ گهاندن؛ یاونەی؛ یاونای؛ پنەیاونەی؛ ڕەسانن؛ ڕەساندن: ۱. کەسێک یان شتێک تا جێگەیەک بردن ‹بچه را به مدرسه رساندم: منداڵەکەم گەیاندە قوتابخانە› ۲. پێگەیاندن؛ وتنەوەی پەیامێک بۆ ڤەگری ‹سلام مرا به او برسان: سڵاوی منی پێ بگەیەنە› ۳. پێگەیاندن؛ کەسێ یان شتێ خستنە کارێک یان ڕووداوێکەوە ‹زیان رساندن: زیان پێ‌گەیاندن› ٤. کەسێ یان شتێ پەروەراندن یان هەراش کردن و پەرە پێدان ‹کسی را به مقامی رساندن: کەسێ بە پایەیەک گەیاندن› ٥. *[گفتاری]* پێگەیاندن؛ ڕاگەیاندن؛ یاونە پنەی؛ هەڤ گهاندن؛ ئاگادار کردنەوە؛ هەواڵ دان ‹به او رسانده بود که قرار است خانه را بفروشد: پێی گەیاندبوو کە بڕیارە ماڵەکە بفرۆشێ› ٦. پێگەیاندن؛ دابین‌کردن؛ بەرهەڤ کرن؛ دابەستن؛ ئامادە و تەیارکردن ‹مقاله را تا فردا برسان: وتارەکە تا بەیانی پێ‌بگەیێنە› ۷. شتێک لەگەڵ مەبەست یان ماوەیەکی تایبەتیدا هاوئاهەنگ یان سازگار کردن ‹باید با همین پول خودمان را تا آخر ماه برسانیم: دەبێ هەر بەم پارەیە خۆمان بگەیێنینە سەری مانگ› ✻ **رسانیدن**. هەروەها: **رساندنی**

■ صفت فاعلی: **رساننده** (گەیێنەر)/ صفت مفعولی: **رسانده** (گەیێندراو)/ مصدر منفی: **نَرساندن** (نەگەیاندن)

**رسانه** / resāne, rasāne، ـها/: *اسم.* ڕەسێنە؛ ڕەسانە؛ ڕاگەهانە؛ کەرەسەیەک بۆ ڕاگەیاندنی پەیام.

▣ **رسانەی گروهی/ همگانی/ جمعی:** کەرەسەی پەیوەندی گشتی؛ کەرەسەیەک کە خەبەر یان پەیامێک بە تاقمێکی زۆر لە خەڵکی ڕادەگەیێنێ.

**ـ رسانی** / resānî, rasānî، ـها/: *پیواژە.* ـگەیێنی؛ ـبەری؛ ـڕەسێنی؛ چۆنیەتی گەیاندن ‹نامەرسانی: نامەگەیێنی›.

**رسانیدن** / resānîdan,rasānîdan/ ☜ **رساندن**

**رسایل** / rasāyel/: [عربی] جمعِ ☜ **رساله: رسائل**

**رسایی** / resāyî, rasāyî/: *اسم.* ڕەسایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕەسا بوون: **رسائی**

**رست** / rast/: *اسم. [ریاضی]* پانایی؛ بەر؛ وەر؛ مەودای ئەستوونی لە تەوەرەی درێژاییدا.

**رست**[1] / rost/ ☜ **رُس**

**ـ رست**[2]: *پیواژە.* ـ ڕسک؛ ـ نیا؛ ـ ڕس؛ ئەوەی کە دەڕوێ ‹خودرست: خۆڕسک›.

**رستاخیز** / rastāxîz/: *اسم.* ۱. پەشڵان؛ پەسڵان؛ سەڵا؛ قیا؛ قیامەت؛ ڕەوتی ئاخێزانەوە؛ ڕابوونەوە؛ ژیانەوەی دوای مەرگ؛ هەستانەوەی دوای مردن ۲. *ـها/* بزووتنەوە؛ خەبات؛ کار و ڕەوتی تێکۆشان بۆ لە بەین بردنی هەر چەشنە خراوی یان دواکەوتنێک.

**رستگار** / rast(e)gār، ـان/: *صفت. [ادبی]* ڕزگار؛ ئازاد؛ ئازا؛ ڕەها؛ ڕەهی؛ دەرباز؛ خەلاس؛ قوتار؛ دەرباس؛ بەشدار لە ڕزگاری. هەروەها: **رستگار بودن؛ رستگار شدن**

**رستگاری** / rast(e)gārî/: *اسم.* ڕزگاری؛ ئازادی: ۱. دۆخ یان چۆناوچۆنی دەرباز بوون یان دوور بوون لە مەترسی ۲. ڕەوتی گەیشتن بە ئامانج یان دۆزینەوەی ڕێگەی گەیشتن بە مراو ‹راستی، مایەی رستگاری است: ڕاستی هەوێنی ڕزگاریە›.

**رستم** / rostam/: *صفت. [کنایی]* پاڵەوان؛ بەهێز؛ ڕۆسەم؛ گەڕناس؛ میرپەنجە؛ مەرخوز؛ زۆردار.

▣ **رستم درِ حمام:** *[کنایی]* پاڵەوانفس ــ فس؛ پاڵەوان‌پەمە؛ لاتی چۆلایی؛ پاڵەوانی درۆینە؛ ناوی بێ ناوەرۆک.

رستم و یک دسته اسلحه: *[کنایی]* دوکانی بەکرە و دوو قاڵب سابوون؛ دۆخـی هـەبوونی تـەنیا یـەک ئـامێر یـان ڕێچـار، بەتایبـەت بـۆ جل‌وبەرگ.

**رستن** / rastan/: مـصدر. *لازم. [ادبـی]* // **رسـتی:** خەلسای؛ **می‌رهی:** دەخەلسی؛ **رها شـو:** بخەلـسە// خەلـسین؛ خەلـسان؛ خەلـستن؛ داخەلـسان؛ فلتین؛ دەرباز بـوون؛ سـەر هلینـان؛ ڕەسـتەی؛ ڕەسین؛ ڕاپسکان؛ وەربیەی؛ ڕزگار بوون.

■ صفت مفعولی: **رَسـته** (خەلـساو)/ مـصدر منفی: **نَرَستن** (نەخەلستن)

**رسـتن** / rostan/: مـصدر. *لازم. [ادبـی]* // **رسـتی:** ڕسکایت؛ **می‌رویـی:** دەڕسـکی؛ **بِـرو(ی):** بڕسـکە// ڕسکان؛ ڕەهستن؛ ڕسەی؛ ڕسـای؛ ڕپـان؛ ڕوان؛ ڕوویان؛ شین بوون؛ هەڵـدابوون؛ ڕەوانی ڕوەک؛ سەوز بوونی گیا.

■ صـفت مفعـولی: **رُسـته** (ڕسـکاو)/ مـصدر منفـی: **نَرُستن** (نەڕسکان)

**رسـتنگاه** / rostangāh/: *اسـم.* ڕواوگـه‌؛ ڕوار؛ جێگەی ڕوان.

**رستنی** / rostanî، ـها/: *اسم.* ڕوەک؛ گیا؛ گیـاو؛ گژ؛ هەر چی لە زەوی شین دەبێ.

**رسـتوران** / restûrān، ـهـا/: [فرانـسوی] *اسـم.* خواردنگـە؛ خوارنگەهـ ؛ ئاشـخانە؛ چێـشتخانە؛ شوێنی دامـەزراو بـۆ خـواردن و خواردنـەوەی مشتەریان.

**رسته** / raste، ـها/: *اسم.* ڕزگ؛ ڕیـز؛ ڕز؛ پێـرە: ۱. دەستە و تـاقمی هاوکـار یـان لـە پەنایـەک ۲. هەر کام لە تاقمگەلی پسپۆڕی، بەتایبەت لـە قۆشەن و سپادا.

**رستی** / rostî/ ☜ **رُسی**

**رسد** / rasad/: *اسم.* ۱. *[نظامی]* پـەل؛ پـاژێکی چەکـداری بەرانبـەر سـێ جووخـە (۲٤ کـەس) ۲. دەستەی پێشاهەنگی ۳. *[قدیمی]* باهر؛ پشک؛ بەش؛ بەشە؛ گوێچ.

**رسـدبـان** / rasadbān، ـان/: *اسـم.* سـەرپەل؛ فەرماندەی پەل.

**رسـدیار** / rasadyār، ـان/: *اسـم.* ڕابـەری دەستەیەکی پێشاهەنگی.

**رسل** / rosol/: [عربی] جمعِ ☜ **رَسول**

**رسم** / rasm، ـها/: [عربی] *اسم.* ۱. وێنـە؛ ئـەوەی بـە قەڵـەم کێـشراوە ۲. وێنـەی خـەتی شـتێ ۳. /رسـوم/ داب؛ هۆرتـە؛ ڕسـت؛ گەلەمپـەری؛ ڕەسـم؛ ڕێوشـوێنی بـاو و پەسـندکراوی نێـو کۆمەڵگا ‹رسم لباس پوشیدن: دابـی جل‌وبەرگ بـەر کردن› ٤. *[منطق]* ڕەسم؛ ئەوەی شـتێ لـە ڕووی نیشانەکانیەوە بناسێنێ (وەک ئەمەی لەمەڕ مرۆوە بگوترێ: «گیانەوەری ئاخێوەر»).

▣ **رسم خـط:** ۱. ڕێنـووس؛ شـێوەی نووسـینی واتەکان و نیشانەگەلی خاڵبەندی ۲. شـێوەی جـوان نووسـین؛ شـێوازی خۆشنووسـی/ گوندەنووسی.

**رسماً** / rasman/: [عربی] *قید.* بە شێوەی فـەرمی؛ بەرانبەر لەگەڵ بنەما و ڕێوشوێنی پەسندکراو.

**رسمدان** / rasmdān، ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ڕێوشـوێن‌زان؛ داب‌ونـەریت‌زان؛ هۆرتـەزان؛ ئاگادار لە ڕەسم و داب و دەسـتووری بـاو ‹باید یک نفر آدم رسمدان جلو بیافتد و مراسم را اداره کند: دەبـێ یـەکێکی ڕێوشـوێن‌زان پـێش بکـەوێ و ڕێوڕەسمەکە بەڕێوە ببا›.

**رسـمدانی** / rasmdānî/: [عربـی/ فارسـی] *اسـم.* ڕێوشـوێن‌زانی؛ نـەریت‌زانی؛ هۆرتـەزانی؛ ئاگاداری لە ڕێوشوێنگەل؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی ڕێوشوێن‌زان بوون.

**رسمی**[1] / rasmî، ـها/: [عربی] *صفت.* ۱. فـەرمی؛ ڕەسمی؛ سازگار و هاوڕەنگ لەگەڵ قانوونگەل و ڕێوزێی وەرگیراودا ‹جلسەی رسمی: دانیشتنی فەرمی› ۲. فەرمی؛ ڕەسمی؛ بەپێی قـانوون یـان نەریتی جەماوەر ‹دیدار رسمی: دیمانـەی فـەرمی› ۳. ئاسایی ‹گوجەفرنگی رسمی: تەماتەی ئاسایی›.

**رسمی**[2]: *قید.* فەرمی؛ ڕەسمی؛ بە شێوەیێکی وشک و شێلگیر، بەرامبەر بە داب و دەستوور جووڵانەوە. بەرانبەر: **خودمانی؛ دوستانە؛ صمیمانە**

**رسمیت** / rasmîyyat/: [عربی]/*اسم.* دۆخ یان چۆنیەتی فەرمی بوون ‹رسمیت جلسه اعلام شد: فەرمی بوونی دانیشتنەکە ڕاگەیێندرا›.

◘ **رسمیت داشتن:** خاوەن ڕێز و بڕشتی قانوونی بوون. هەروەها: **رسمیت بخشیدن؛ رسمیت دادن؛ رسمیت یافتن**

**رسن** / rasan، ـها/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* گوریس؛ گروێس؛ گورویس؛ وەریس؛ وەریسە؛ ڕەسنە؛ ڕێسمان؛ پەت؛ پەتە؛ پەتک؛ کندر؛ تەناف؛ تەنافە؛ پەتی درێژ و هێندێک ئەستوور.

**رسن تاب** / rsantāb، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم. [ادبی]* ۱. پەتڕێس؛ پەتجەڕ؛ کندرپێچ؛ لەتەرە ڕێسە(مێینە)؛ کەسێ کە ڕێسمان دەگرێتەوە یان دەچنێ ۲. *[نامتداول]* جاڵجاڵووکە؛ جۆلاتەنە؛ داوتەنە؛ کاکڵەمووشان؛ داوداوی؛ ئەڤنپێچ؛ دۆباڵ.

**رسوا** / rosvā/: *صفت.* ۱. /ـها؛ ـیان/ ناوزڕاو؛ ئابڕووتکاو؛ بێئابڕوو؛ ئابڕوونەماو؛ ڕسوا؛ تڕۆ؛ خەنزار؛ نامڤەت؛ لومە؛ بەدناو؛ ناوزڕیاگ؛ شەرمنەماو؛ حەیاتکاو؛ بێشەرم؛ حەیاچووگ؛ گوسارتمە ‹شما می‌خواهید با این شخص رسوا همکاری کنید؟: ئێوە دەتانەوێ لەگەڵ ئەم کابرا ناوزڕاوەدا هاوکاری بکەن؟› ۲. *[ادبی]* نەچێ؛ نەنگین.

◘ **رسوا شدن:** ڕسوا بوون؛ ئابڕوو چوون؛ ناو زڕان؛ ئابڕوو تکان؛ دەلقین.

**رسوائی** / rosvā'î/ ☜ **رسوایی**

**رسوایی** / rosvāyî، ـها/: *اسم.* ڕسوایی؛ دەلق؛ سووکی؛ بێئابڕوویی؛ خەنزاری؛ ئابڕووتکاوی؛ ڕووسیایی؛ ناوزڕاوی؛ دۆخ یا کارێ کە بە هۆی دژایەتی لەگەڵ بایەخگەلی کۆمەڵگادا دەبێتە هۆی حەیا چوون و ناوخراوی: **رسوائی**

**رسوب** / rosûb, rusûb، ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم.* بنەنیش؛ بنەنیشتە؛ ملت؛ تاچن؛ گیرهە؛ پەگر؛ تمتم؛ تمتمان؛ غلفۆش؛ تەینشین؛ ڕەوتی بننانەوە.

◘ **رسوب بادی:** تەینیشتوویەک کە بە هۆی باوە پێکهاتبێ (وەک تەپۆلکەی ماسەیی بەستێن).

◘ **رسوب دادن:** بنەنیش‌کردن؛ تەینشین‌کردن.

**رسوب کردن:** نیشتن؛ نشتن؛ تلتەبن کەوتن؛ نیشتنە بن؛ تەینشین بوون؛ بنەنیشتە بیەی.

**رسوب‌شناسی** / rosûbšenāsî, rusûb-/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* پانشتەناسی؛ تلتەناسی؛ لقێ لە زانستی زەوی‌ناسی کە لە بنەنیش یان بەردی تمتمانی دەکۆڵێتەوە.

**رسوبی** / rosûbî, rusûbî/: [عربی] *صفت.* بنەنیشتە؛ تەینیشتە؛ پانیشتە ‹این دشت از مواد رسوبی تشکیل شده است: ئەم دەشتە لە ماکگەلی بنەنیشتە پێکهاتووە›.

**رسوخ** / rosûx, rusûx/: [عربی]/*اسم.* جێ‌وەگری؛ دزە؛ ڕەگاژۆیی؛ کار یان ڕەوتی ڕێگە خۆش کردن بۆ ناو شتێک و تێیدا دامەزران ‹فکری به ذهنم رسوخ کرد: بیرێک لە مێشکمدا جێ‌گرت›.

**رسول** / rasûl، ـان/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* ۱. /رُسُل/ پێغەمبەر؛ پەیامبەر ‹رسول خدا: پێغەمبەری خودا› ۲. *[قدیمی]* ناردراو؛ نێردراو ‹رسول امپراتور روم نامەای آورد: ناردراوی ئیمپراتووری ڕۆم نامەیەکی هێنا›.

◘ **رسول اکرم:** پێغەمبەری هێژا؛ پێغەمبەری مەزن.

**رسول‌الله** / rasûlallāh/: [عربی]/*اسم.* نێردراوە لە لایەن خواوە؛ ناردراوی خودا.

**رسوم** / rosûm, rusûm/: [عربی] جمعِ ☜ **رَسم**

**رسومات** / rosumāt, rûsumāt/: ۱. (!) [عربی] *اسم.* جمعِ ☜ **رَسم** ۲. کارخانەی دروستکردنی خواردنەوەی ئەلکولی.

**ـــ رسی** / resî, rasî/: *پیواژه.* ـــ ڕەسی؛

پێڕاگەیشتن ‹دادرسی: دادرەسی›.

**رسی** / rosî/: *صفت*. ڕسینە؛ ڕسین؛ ڕسی: ۱. بە خاکەسوورە ‹نهشت رسی: ماشی رسینە› ۲. لە جنسی خاکەسوورە ‹جلگەی رسی: مەخەری رسینە› * **رُستی**

**رسیتال** / resîtāl ، ـها/: [فرانسوی]*اسم*. *[موسیقی]* ڕێسیتاڵ؛ کونسرتێ کە لە لایەن تاقە ژەنیارێک یان سترانبێژێکەوە بەڕێوە دەچێ.

**رسید** / resîd, rasîd ، ـها/: *اسم*. دڤانەک؛ ڕەسید؛ نووسراوەیێ کە گرتنی شتێ لە لایەن نووسەرەکەیەوە دەسەلمێنێ ‹پول را کە می‌دهی رسیدش را بگیر!: پارەکە دەدەی، دڤانەک وەرگرە!›. هەروەها: **رسید خواستن؛ رسید دادن؛ رسید گرفتن؛ رسید نوشتن**

**رسیدگی** / resîdegî, rasîdegî ، ـها/: *اسم*. ۱. پێگەیشتوویی؛ پنەیاوایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی پێگەیشتوو بوون ‹بچەها در سن رسیدگی بودند: منداڵەکان لە تەمەنی پێگەیشتوویدا بوون› ۲. پێڕاگەیشتوویی؛ سەرکەشی؛ کار یان ڕەوتی لێپرسینەوە؛ چنەوە پەرسەی؛ سەرپەرستی و بە سەر ڕاگەیشتن و پارازتنی کەس یان شتێک ‹باید بە حادثەدیدگان رسیدگی کرد: پێویستە بە لێقەوماوان بپرانگەین› ۳. کار یان ڕەوتی پرسینەوە؛ پێڕاگەیشتن؛ چنەوە پەرسەی؛ تۆژینەوە و پرس و ڕا، بۆ تێگەیشتن لە چۆناوچۆنی ڕووداوێک ‹رسیدگی بە شکایت مردم: لێپرسینەوە لە سکاڵای خەڵک›. هەروەها: **رسیدگی شدن؛ رسیدگی کردن**

**رسیدن** / resîdan, rasîdan/: *مصدر لازم*. // **رسیدی**: گەیشتی؛ **می‌رسی**: دەگەی؛ **برس**: بگە// گەیشتن؛ گیشتن؛ گەیین؛ گەین؛ گەهیشتن؛ گەهین؛ گەهان؛ گهان؛ گەشتن؛ گەشتان؛ گەزین؛ یاوەی؛ یاوای؛ ڕەسین: ۱. ڕۆیشتن تا جێیەک و دامەزران تێیدا ‹بە خانە رسیدن: گەیشتنە ماڵەوە› ۲. ڕەبیتن؛ پێگەیشتن؛ هەڵهلین؛ خسن؛ پنەیاوەی؛ هەراش بوون؛ بلۆق بوون ‹رسیدن میوە: گەیشتنی میوە› ۳. بەئەندازە بوون؛ ڕێک بوون؛ یەک ئەندازە بوون ‹قدش بە دو متر می‌رسید: بالای بە دوومیتر دەگەیشت› ٤. هاتن؛ ئامەی ‹رسیدن بهار: گەیشتنی بەهار› ٥. *[گفتاری]* هەڵ دەسکەوتن؛ پەرژان؛ دەرفەت هەبوون؛ پەردەچیەی ‹نرسیدم بە سلمانی بروم: نەگەیشتم بچمە دەلاکی› ٦. دەسکەوتن؛ دەس‌یاوەی ‹بە مقامی رسیدن: گەیشتنە پایەیەک› ۷. پێڕاگەیشتن؛ پەرستاری کردن؛ پۆرە یاوەی ‹بە درختها رسیدن: گەیشتنە دارەکاندا› ۸. پێکگەیشتن؛ پنە یاوەی؛ یاوەی هەنترینی؛ تووشی یەکتری هاتن ‹بە هم رسیدن: گەیشتنە یەک› ۹. درێژەدار بوون تا شوێن یا قۆناغێک ‹قصە بە آنجا رسید کە...: داستانەکە گەیشتە ئەوێ کە...›. هەروەها: **رسیدنی**

■ صفت مفعولی: **رسیدە** (گەیشتوو)/ مصدر منفی: **نَرسیدن** (نەگەیشتن)

**رسیدە** / resîde, rasîde/: *صفت*. ۱. باڵغ؛ پێگەیشتوو؛ پێگەییگ؛ ڕەسا ‹دختر رسیدە: کچی پێگەیشتوو› ۲. گەیشتوو؛ گەییگ؛ گەیوو؛ ڕەسیو؛ ڕەسیدە؛ نێرسایا؛ گەهیشتی؛ یاوا؛ یاوەی (لەمەڕ میوەوە) بە هەراش؛ بە گەشکەی تەواو. بەرانبەر: **کال** ‹انجیر رسیدە: هەنجیری گەیشتوو›.

**رش** / raš/ ☜ **اَرَش**

**رشادت** / rešādat, rašādat ، ـها/: [عربی]*اسم*. دلێری؛ جوامێری؛ دلاوەری؛ بوێری؛ ئازایەتی ‹این کار رشادت نیست، حماقت است: ئەم کارە دلێری نیە، دەبەنگیە›.

**رشتن** / reštan/ ☜ **ریسیدن**

**رشته** / rešte ، ـها/: *اسم*. ۱. ڕستە؛ ڕست؛ ڕس؛ ڕستک؛ ڕسک؛ هەفدە؛ هەڤۆ؛ پۆ؛ ڕشتە؛ تاڵ؛ تاڵە؛ ڕژدە؛ ماکێکی درێژی نەرمۆک بە شێوەی هەوداگەلێک کە پێکەوە بادراون یان ئاڵقەگەلێک کە بە دوای یەکدان ‹رشتەی نخ:

ڕستەی دەزوو› ۲. تاڵ؛ تاڵە؛ ڕشتە؛ ڕست؛ ڕس؛ ڕستک؛ ڕستە؛ ڕسک؛ هەڤدە؛ هەڤۆ؛ بەن؛ ڕژدە؛ یەکەی ژماردنی شتانی وا ‹چهار رشته سیم: چوار تاڵ سیم› ۳. ڕشتە؛ گشتەک؛ کشتەک؛ ڕژدە؛ لەموو؛ داو؛ هەودا؛ ڕێس؛ ڕەسن؛ وەریس؛ ڕست؛ ڕس؛ ڕستک؛ ڕستە؛ ڕسک؛ هەڤدە؛ هەڤۆ؛ فرێت؛ هەودایەک کە بادراوە و بە شێوەی بەن دەرهاتووە ٤. هەڕشتە؛ ڕشتە؛ بەرهەمێکی چێشتین لە هەویری نان، کە بە شێوەی نەوارگەلێکی باریک بڕدراون و ئیشک کراون و لە بڕێک چێشتدا بەکاردێ ‹رشتەی پلوی: هەڕشتەی پلاوی› ٥. ڕزد؛ ڕزدە؛ ڕزدی؛ گازە؛ گەڵوازە؛ ڕزگ؛ سەفان؛ ڕزن؛ زنجیرە؛ ڕێزێ لە شتگەل یان ڕووداوگەلی سەر بە یەک ‹رشتە‌کوە: ڕزدی کێو› ٦. *[فیزیولوژی]* کشتەک؛ پێکهاتەی درێژ و بەن‌ئاسای شانەگەلی بوونەوەر ‹رشتەی ماهیچە‌ای: کشتەکی ماسوولکەیی› ۷. نەخۆشینێ پێستی کە بە هۆی ئەنگەلێ بە نێو «ڕشتە»وە لە قاپوورەی پێ یان مەچەکدا سەرهەڵدەدا ۸. ڕشتە؛ پشک؛ بابەت و بواری کارێک ‹رشتەی شغلی: ڕشتەی پیشەیی›.

▣ **رشتەی سخن را بە دست گرفتن:** *[مجازی]* سەری قسە گرتنە دەستەوە؛ لە وتوویژ یان وتاربێژیدا بەشداری‌کردن و درێژە پێدان.

**رشتەها را پنبە کردن:** *[مجازی]* ڕیس کردنەوە بە خوری؛ ڕەنج دانەبا؛ ڕەنج ئاویەرە دەی؛ ئاکام و ئەنجامی کارێک تێکدان و لەبەین بردن ‹مادربزرگ همەی رشتەها را پنبە کرد و نقشەی ما نقش بر آب شد: دایەگەورە هەموو ڕیسمانی کردەوە بە خوری و نەقشەکەمانی بەتاڵ کردەوە›.

**بە رشتەی تحریر درآوردن:** نووسین.

**رشته‌پلو** / :reštepolow, -polo/: *اسم.* ڕشتەپلاو؛ جۆرێ پلاو کە هەڕشتە و گۆشت و جاروبار مێوژ و خورمای سوورەوەکراوی تێدەکەن.

**رشته‌فرنگی** / :reštefarangî/: *اسم.* هەڕشتە فەرەنگی؛ بەرهەمێکی چێشتینەیە بە شێوەی ڕشتەگەلی باریک کە بەتایبەت دە چێشتاوی دەکەن.

**رشد** / :rošd/: [عربی] *اسم.* خیف؛ زۆج؛ هڕ؛ بار: ۱. گەشکە؛ هەرەش؛ کار یان ڕەوتی گەورە بوون ‹پسر سارا خوب رشد کرده بود: کوڕەکەی سارا باش خیف ببوو› ۲. هەراش؛ فەراژی؛ فەراژوو؛ فراژی؛ کار یا ڕەوتی زۆر بوون؛ پەرە سەندن؛ لە زیاد بوون؛ فرە بوونەوە ‹رشد جمعیت: زۆربوونەوەی ئاپۆرە› ۳. پێشڕەوت؛ ڕەوتی گەشە سەندن؛ چڵ‌کێشان؛ ئێوزینەکردن؛ گەشەدار بوون ‹رشد کشاورزی: پێشڕەوتی کشت‌وکاڵ›.

**رشک** / :rašk, rašg/: *اسم. [ادبی]* ئێرەیی؛ کاڵ؛ سوو؛ هەست بە ناخۆشی و ئازار دیتن لە هەڤیازی و خۆشی و بەرز بوونەوەی خەڵکی ‹همە بە او رشک می‌بردند: هەموو ئێرەییان پێ دەبرد›. هەروەها: **رشک بردن؛ رشک ورزیدن**

**رشک** / rešk, rešg، ـها/: *اسم.* سپیلک؛ ڕشک؛ ڕشکی؛ میتک؛ مێتکە؛ مێتوکە؛ کەرا؛ گەرای ئەسپێ.

**رشن** / rašn، ـها/: *اسم.* تەپۆلکە؛ تەپ؛ تەپک؛ تەپە؛ گر؛ گرد؛ گردۆک؛ کۆمت؛ کۆمە یان تەپۆلکەی خڕ.

**رشوه** / rešve, rošve، ـها/: [عربی] *اسم.* بەرتیل؛ هبوودی؛ ڕشوەت؛ ڕشفەت؛ ڕشپەت؛ پوولێ کە خاوەن دەسەڵات بۆ ڕێک‌خستنی کارێک بە ناڕەوا دەیسێنێ ‹دیگر طوری شدە بود کە برای نوشتن اسم بچەها هم باید رشوه می‌دادیم: ئیتر وای لێ هاتبوو بۆ ناونووسی منداڵەکانیش دەبوا بەرتیلمان بدایە›. هەروەها: **رشوه دادن؛ رشوه گرفتن**

**رشوه‌خوار** / rešvexār, rošve-، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بەرتیل‌خۆر؛ بەرتیل‌خواز؛ خووگرتوو یا لایەنگری بە گرتنی بەرتیل ‹یک مشت مأمور رشوه‌خوار در کار مردم اخلال می‌کنند:

تاقمێک مەئموورى بەرتیل‌خور بشێوە دەخەنە نێو کاری خەڵکەوە›.

**رشوه‌خواری** / reševexārî, rošve- ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. بەرتیل‌خۆری؛ کار و پیشەیەک کە لە ڕێگای بەرتیل گرتنەوە بارەچەی ببێ.

**رشوه‌گیر** / reševegîr, rošve- ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. بەرتیل خۆر؛ بەرتیل‌گر.

**رشید** / rašîd/: [عربی] صفت. پێگەیشتوو؛ بالای باڵداو؛ بلەرمان ‹جوان رشید: لاوی پێگەیشتوو›.

**رصد** / rasad ، ـها/: [عربی]/اسم. [نجوم] کار و ڕەوتی دیتن و ناسینەوە و بەدووی تەنگەلی ئاسمانیدا گەڕان.

**رصدخانه** / rasadxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئاسمان‌پێو؛ جێگەیەک کە تێیدا بە ئامرازانێکی تایبەت، تەنگەلی ئاسمانی دەبینن و دەیانناسن و دەیانپێون.

**رضا**[1] / rezā/: [عربی]/اسم. ڕەزا؛ ڕەزامەندی ‹برای رضای خدا: بۆ ڕەزای خودا›.

◘ **رضا داشتن:** ڕازی بوون؛ ڕەزا بوون.

**رضا**[2]: صفت. [گفتاری] ڕازی؛ ڕەزا؛ دۆخی پێ‌خۆش بوون ‹من رضا نیستم یک مو از سرش کم شود: من ڕازی نیم تاڵێک مووی لێ کەم بێتەوە›.

**رضاعی** / rezāʾî/: [عربی] صفت. [ادبی] شیری؛ شیرەکی؛ پێوەندیدار بە شیر خواردنەوە.

◙ **برادر رضاعی** ☜ **برادر**

**خواهر رضاعی** ☜ **خواهر**

**مادر رضاعی** ☜ **مادر**

**رضامندی** / rezāmandî/: [عربی/ فارسی]/اسم. ڕەزامەندی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕەزا بوون.

**رضایت** / rezāyat ، ـها/: [از عربی]/اسم. قیم؛ ڕا؛ ڕەوت یا دۆخی ڕازی بوون؛ پێ ڕازی بوون؛ قایل بوون؛ قادێ بوون.

◘ **رضایت دادن:** ڕەزایەت دان: ۱. ڕازی بوون؛ مل نیانە ڕاسە؛ مل هاوردنە ڕاسی ‹عاقبت بە عروسی دخترش رضایت داد: ئاخری بۆ زەماوەندی کچەکەی ڕەزایەتی دا› ۲. لە دادی خۆ چاو پۆشین ‹بالاخره رضایت داد و آرام را آزاد کردند: ئاخری ڕەزایەتی دا و ئارامیان ئازادکرد›.

**رضایت داشتن:** لێ‌ڕازی بوون؛ ڕەزایەت دان؛ دڵخۆش بوون ‹همه در این محله از او رضایت دارند: هەموو لەم گەڕەکەدا لیی ڕازین›.

**رضایت‌بخش** / rezāyatbaxš/: [عربی/ فارسی] صفت. هۆی دڵگراوەیی و ڕازی بوون.

**رضایتنامه** / rezāyatnāme ، ـها/: [از عربی/ فارسی]/اسم. ڕەزایەتنامە؛ نامەیەک کە تێیدا هەست بە ڕازی بوون و دڵڕوونی لە کار یان کردەوەی کەسێک، گرۆ یان ڕێکخراوەیەک دەربڕاوە.

**رطب** / rotab ، ـها/: [عربی]/اسم. خورمای تازە؛ خورمای تەڕ.

**رطل** / ratl ، ـها/: [معرب از لاتینی]/اسم. ڕەتل؛ پێوانەیەکە لە وڵاتانی جۆراوجۆردا کەم و زیاد ئەکا و لە ۳۰۰ گرەمەوە تا دەوری ۱۸۰۰ گرەمی هەیە و بەرامبەر بە ۸٤ مسقاڵیشیان گرتووە.

**رطب‌ویابس** / rotab-o-yābes/: [عربی]/اسم. ۱. [نامتداول] تەڕ و وشک؛ شتگەلی تەڕ و وشک ۲. [کنایی] هاتەران-پاتەران؛ هەڵەق‌ـ مەڵەق؛ قرت‌وقین ‹یک مشت رطب‌ویابس تحویل داد و گذاشت و رفت: بڕێ هاتەران-پاتەرانی گوت و لێیدا ڕۆیشت›.

**رطوبت** / rotûbat, rutûbat ، ـها/: [عربی]/اسم. شێ؛ نم؛ شە؛ شۆ؛ مچەو؛ لەزم؛ شەم؛ قەراوی؛ قەڕای؛ هوت؛ هێمی؛ هێمێتی؛ هێمیتی؛ هێو؛ هێوایی؛ هێوی؛ هێویتی: ۱. تەڕایی؛ تەڕی؛ هەڵماو لە هەوادا ‹میزان رطوبت ۸۵٪، دما ۱۰ درجه بالای صفر: ڕادەی شێ ۸۵٪، دەما ۱۰ پلەک بان سیفر› ۲. وردیلە ئاوی هەڵمژیاگ بە هۆی شتانێکی وەک پارچە یان خاکەوە ‹هنوز کمی رطوبت دارد: هێشتا کەمێ نمی هەیە›.

**رطوبت‌سنج** / rotûbatsanc, rutûbat-/: [عربی/

فارسی] ☜ **نَم‌سنج**

**رطوبت‌گیر** / rotûbatgîr, rutûbat- /: [عربی/ فارسی] ☜ **نمگیر**

**رطوبت‌گیری** / rotûbatgîrî, rutûbat- /: [عربی/ فارسی] ☜ **نمگیری**

**رطوبی** / rotûbî, rutûbî /: [عربی] *صفت.* شێدار؛ نمار؛ نمدار؛ نماوی؛ هێودار ‹هوای رطوبی: هەوای شێدار›.

**رطیل** / roteyl /: [عربی] ☜ **رُتیل**

**رطیلا** / roteylā /: [عربی] ☜ **رُتیلا**

**رعاف** / ro'āf /: [عربی]/*اسم.* /*ادبی*/ دۆخ یان چۆناوچۆنی ڕسکین؛ دارِسان؛ پژانی کەپۆ؛ خوێن لە لووت هاتن؛ لووت فشیەی؛ خوێن لووت بەر بوون.

**رعایا** / ro'āyā, ra'āyā /: [عربی] جمعِ ☜ **رَعیّت**

**رعایت** / re'āyat, ra'āyat، ـها /: [عربی]/*اسم.* کار یا ڕەوتی لە بەرچاو گرتن یان ڕێزگرتن؛ بەرهەمی ڕچاوکردن. هەروەها: **رعایت شدن؛ رعایت کردن**

**رعب** / ro'b، ـها /: [عربی]/*اسم.* /*ادبی*/ ترس؛ سام؛ بیم ‹همه از آن صدا دچار رعب شدیم: هەموو لەو ناڵەیە ترس دایگرتین›.

**رعب‌آور** / ro'bāvar /: [عربی/ فارسی] *صفت.* ترسێنەر؛ ترساوەر؛ سامدار؛ هۆی پەیدا بوونی ترس ‹صدای رعب‌آوری شنیدیم: دەنگێکی ترسێنەرمان بیست›.

**رعب‌انگیز** / ro'bangîz /: [عربی/ فارسی] *صفت.* ترسێنەر؛ ترساوەر؛ ترس‌ئەنگێز ‹غرش رعب‌انگیزی سکوت شب را شکست: گرمەیەکی ترسێنەر بێدەنگی شەوی شکاند›.

**رعد** / ra'd، ـها /: [عربی]/*اسم.* گوڕژ؛ هەورەگرمە؛ هەورەگۆڵە؛ گرمەی هەور ‹از صدای رعد بیدار شدم: لە گرمەی گوڕژ ڕاچڵەکیم›.

**رعدآسا** / ra'dāsā /: [عربی/ فارسی] *صفت.* ۱. گوڕەئاسا؛ گوڕەگۆڕەبا؛ گوڕژە؛ دەنگی زۆر توندی وەک گوڕژانی هەور ۲. /*مجازی*/ نرکە؛ گوڕە؛ ناڵە؛ شریخە؛ شریخ؛ شریقە؛ شریق؛ چریقە؛ بە دەنگێکی زۆر بڵیندەوە.

**رعدزا** / ra'dzā /: [عربی/ فارسی] *صفت.* گوڕژهێنەر؛ پێکهێنەر یان هۆی بەدیهاتنی هەورەگرمە.

**رعدوبرق** / ra'd-o-barq /: *اسم.* هەورەتریشقە؛ ئەورەتەرەقە؛ تەشبرق؛ ئاسمان‌قیرە؛ بەلاچەهڕ؛ گرمە و تریشقەی هەور؛ برووسکە و شریخەی هەور.

**رعشه** / ra'še، ـها /: [عربی]/*اسم.* لەرزە؛ لەرە؛ هەژەک؛ شەکەی وەک یەک و پەیتا‌پەیتای ئەندامانی لەش، بەتایبەت دەست و پێ ‹دستهای پیرمرد رعشه داشت: دەستی پیرەمێردەکە، لەرزەیان بوو›.

**رعنا** / ra'nā /: [عربی] *صفت.* شەنگ؛ شەنگە؛ شەنگین؛ جوان و لەبار؛ ڕەپ‌ڕەپە؛ خشکۆک؛ خاوەن بەژن و بالایەکی جوان و تەکووز.

**رعنائی** / ra'nā'î /: [عربی] ☜ **رعنایی**

**رعنایی** / ra'nāyî /: [عربی]/*اسم.* شەنگی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی شەنگ بوون: **رعنائی**

**رعونت** / ra'ûnat /: [عربی]/*اسم.* /*ادبی*/ ۱. قاپانی؛ هوشگی؛ خۆپەسندی؛ خۆبینی ۲. دۆخی خۆ ڕازاندنەوە.

**رعیت** / ra'îyyat، ـها؛ رعایا /: [عربی]/*اسم.* /*قدیمی*/ گجە؛ ڕایەت؛ ڕەعیەت: ۱. جووتیارێک کە بەسەر زەوی ئاغاوە کاری دەکرد و لە گوندی ئاغاشا دەژیا ‹او بیش از سیصد خانوار رعیت داشت: زۆرتر لە سێسەد بنەماڵە گجەی هەبوو› ۲. خەڵکێک کە لە ژێر فرمانی پاتشا یان دەوڵەتێکدا دەژیان ‹رعیت انگلیس: گجەی ئینگلیس›.

**رعیت پرور** / ra'îyyatparvar /: [عربی/ فارسی] *صفت.* گجەپەروەر؛ خاوەن خوو یان حەز بە پێ‌ڕاگەیشتن بە سەر خەڵکی ژێر فرمانی خۆدا. هەروەها: **رعیّت‌پروری**

**رعیت‌نـواز** / ra'îyyatnavāz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* گجەنـەواز؛ بـە خـوو یـان هـۆگری یارمەتی‌دان و دڵنەوایی کردن لـە خەڵـکی ژێـر فرمانی خۆ. هەروەها: **رعیّت‌نوازی**

**رغبت** / reqbat, raqbat/: [عربی]*اسم.* واز؛ حەز: ۱. ئـۆگرەتی؛ گـرایش؛ کـار و ڕەوتی گـرەوین؛ گراڤین ‹هیچ رغبت به خوردن غذا نشان نمی‌داد: هیچ وازی لە خواردن نەبوو› ۲. ویست؛ خواز؛ خواست ‹آدم رغبت نمی‌کرد بـه صورتش نگاه کند: کـەس نەیدەویست چاو لە ڕوومەتی بکا›.

▣ رغبت داشتن: واز لێ بوون؛ حـەز لـێ بـوون. هەروەها: **رغبت کردن**

**رف** / raf ، ـها/: *اسم.* ڕەف؛ ڕەفە؛ ڕەفک؛ ڕەفکـە؛ ڕف؛ ڕفە؛ ڕفحە؛ ڕفانک؛ تەرواڵ؛ تەرواڵە؛ تاقـەی لە چێو یا گەچ لە دیواردا بۆ شت لە سەر دانان.

**رفاقـت** / refāqat, rafāqat ، ـهـا/: [عربـی]*اسم.* هەوالـەتی؛ هەڤـالینی؛ هەڤـالەتی؛ ئاوالـەتی؛ هـەمبازی؛ هەوالـەتی؛ ئەڤـالی؛ ڕەفێقایـەتی: ۱. دۆستی؛ دۆستایەتی؛ هەڤگری ‹چند بار گفتم با این قماش آدمها رفاقت نکن!: چەندم پێ گوتی لەگەڵ ئـەم هەتیوانـەدا دۆسـتی مەکـە!› ۲. *[نامتـداول]* هاوڕێیی.

**رفـاقتی** / refāqatî, rafāqatî/: [عربـی]*قیـد.* دۆستانە؛ هەوالەتی؛ بە دۆستایەتی؛ بە ئاوالیەتی؛ بـە شـێوەی برادەرانـە ‹نوشـته‌ای رد و بـدل نـشد، همین‌طور رفاقتی معامله کردیم: نووسراوەیەک ئاڵوگۆڕ نەکرا، هەروا دۆستانە مامەڵەمان کرد›.

**رفاه** / refāh/: [عربی]*اسم.* ئاسوودەیی؛ ئاسـایش؛ ڕاحەتی ‹در آنجا امور رفاه مسافران فـراهم شـده بـود: دەوێـدا کـار و بـاری ئاسـوودەیی مـسافران دابـین کرابوو›.

**رفــاهی** / refāhî/: [عربــی] *صفت.* ئاسایـشی؛ پێوەندیدار بە ئاسایشەوە ‹خدمات رفاهی: ڕاژەمەنی ئاسایی›.

**رفت** / raft/: *اسم.* ۱. چـۆ؛ چـوو؛ شـۆ؛ ڕەفـت؛ ڕەوت؛ لوا؛ کار یان ڕەوتی ڕۆیشتن ‹رفـت و آمـد: هـاتوچـو› ۲. *[ورزش]* خـولی هـەوەڵ لـە کێبەرکێگەلی دووقۆناغیدا. بەرانبەر: **برگشت**

**رفتار** / raftār ، ـها/: *اسم.* ئاکـار؛ مـەش؛ ڕەوت؛ ڕتوو؛ ڕەوشت؛ شیوە؛ ڕەڤشت؛ چگۆنی؛ ڕەفتـار؛ کریار؛ کردە؛ کەردە؛ کردار؛ نـول؛ نـۆل: ۱. زێ؛ شـێوەی کـردەوەی گیانـدارێک لـە دۆخ یـان هـەلومـەرجێکی تایبەتـدا ۲. *[زیـستشناسـی]* چۆنیەتی جووڵانەوەی کەس، گرۆ یان تەویرێک لـە شـوێنی خۆیـدا ۳. *[روانشناسـی]* کۆمەڵـی پەرسڤگەلی ئەنـدامی و لـۆیی گیانلەبـەرێک لـە بەرانبەر دۆخ یان کارێکی دیاردەوە ٤. *[مجـازی]* کـۆی کارگـەل و پەیوەندیگـەلی کۆمەڵایـەتی کەسێک ‹تا وقتی زن نگرفته بـود کـسی از رفتـارش راضی نبود: هەتا ژنی نەهێنابوو کەس لە ئاکاری ڕازی نەبوو›.

▣ رفتار کـردن: ڕابەسـتن؛ جووڵانـەوە؛ ڕەفتـار کردن.

**رفتـــارگرایی** / raftgerāyî/: *اسم.* ڕێبـازێکی ڕەوانـشناسیە کـە تـەنیا پەرسـڤگەلی شـیاوی هەڵـسەنگاندن، شـایانی لێکۆڵـینەوە دەزانـێ: **اصالت رفتار**

**رفتاری** / raftarî/: *صفت.* ئاکاری؛ نۆلی؛ ڕتوویی؛ پێوەندیدار یـان سـەر بـە ئاکـارەوە ‹پژوهـشهای رفتاری: پەیدۆزیگەلی ئاکاری›.

**رفتگان** / raftegān/: *اسم.* مـردوان؛ ڕۆیـشتوان؛ مەردێ ‹خدا رفتگان همه را بیامرزد: خوا لە مردوانـی هەموو لایێک خۆش‌بێ›.

**رفتگـر** / roft(e)gar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* پاکـەوان؛ سـپوور؛ کـۆلانمـاڵ؛ زبـڵڕێـژ؛ سـفوور؛ سەبرگەچی؛ زبڵمـاڵ؛ کارگـەرێک کـە کـاری گەسکدانی شەقام و کۆلان و لابردنی زبڵ و زاڵ لە بەر دەرکی ماڵانە.

**رفتگـــری** / roft(e)garî/: *اسم.* پاکـەوانی؛ سپووری: ۱. کاری پاکەوان ۲. کاری گەسکدان

و خاوێن ڕاگرتنی کۆگای گشتی.

**رفتن** / raftan/: مصدر. لازم. // **رفتی**: ڕۆیشتی؛ **می روی**: دەڕۆی؛ **بُرَو**: بڕۆ// ڕۆیشتن؛ مەشین؛ چوون؛ چووین؛ چۆن؛ ڕۆیین؛ ڕووین؛ لوای؛ لووەی؛ شین؛ شیان؛ شیەی؛ هەڕن: ۱. ڕۆیشتنەوە؛ چوونەوە؛ دوور بوونەوە لە لای بێژەر، بیسەر، کەس یان جێگەی دیاریکراو ‹به خانه رفتن: ڕۆیشتنەوە بۆ ماڵ› ۲. دوورینگ یان ڕێگایەک پێوان ‹تا سر کوچه رفت: تا سەر کۆڵان ڕۆیی› ۳. لە جێیەکدا ئامادە بوون، بەتایبەت لە کۆ بوونەوەیەکدا بەشداری کردن ‹رفته بود عروسی: چووبوە زەماوەند› ٤. [گفتاری، مجازی] چوونەوە؛ کێشانەسەر؛ شیایوە؛ وەک یەک بوون؛ لەیەک کردن ‹بچه به عمویش رفته: منداڵەکە چووەتەوە سەر مامی› ۵. چوونەوە؛ لە بارێکدا مانەوە؛ چۆنیەتیەک لێ پەیدا بوون ‹به خواب رفتن؛ از هوش رفتن: چوونە خەو؛ لە هۆش چوون› ٦. دەرچوون؛ جووڵان؛ بزووتن؛ نرقان؛ بزوان؛ وەگەڕ بوون ‹مثل باد رفتن: وەکوو با ڕۆیشتن› ۷. [ادبی] بەسەردا هاتن ‹نمی‌دانی بر ما چەها رفت!: چووزانی چیمان بەسەرهات!› ۸. ویستن؛ گەرەک بوون؛ بەنیاز بوون ‹رفت با مشت او را بزند که دستش را گرفتم: ڕۆیی بە مست لێیدا دەستیم گرت› ۹. لە گەڕکەوتن؛ بڕیانی گەڕانەیەک ‹برق رفت: کارەبا ڕۆیی› ۱۰. [مجازی] لە دەست دان؛ لە کیس‌دان؛ لەکیس چوون ‹خانه رفت: ماڵەکە ڕۆیی› ۱۱. کاری هاوکرد ‹دررفتن: دەرچوون›.
هەروەها: **رفتنی**

■ صفت فاعلی: **رونده** (ـ)/ صفت مفعولی: **رفته** (ڕۆیشتوو)/ مصدر منفی: **نَرفتن** (نەڕۆیشتن)

**رفتن** / roftan/ ☜ **روبیدن**

**رفتنه** / raftane/: قید. [گفتاری] لە ڕۆیشتندا؛ کاتی ڕۆیشتن ‹رفتنه در را ببند: لە ڕۆیشتندا دەرگاکە ببەسە›: **رفتنی**

**رفتنی** / raftanî/ ☜ **رَفتَنه**

**رفت‌وآمد** / raft-o-āmad/: اسم. هات‌وچوو؛ هات‌وچۆ؛ ئاموشۆ؛ هامشۆ؛ ئامەولوای: ۱. کاری ڕۆیشتن و گەڕانەوە ‹در داخل ظرف کوچکی رفت‌وامد می‌کند: لە نێو دەفرۆکەیەکدا هات‌وچوو دەکا› ۲. جووڵان و جێبەجێ بوونی خەڵک، گیانەوەر یان ماشین بە ڕێگادا ‹دو تا مینی‌بوس به آن جا رفت‌وامد دارد: دوو مینەبووس هات‌وچووی ئەوێ دەکەن› ۳. ـها/[مجازی] ئامشۆڕەفت؛ پەیوەندیەک کە دەبێتە هۆی دیداری پەساپەسای چەن کەس لەگەڵ یەکتریدا ‹مدتی با او رفت‌وامد داشتیم: ماوەیەک لەگەڵیدا ئاموشۆمان بوو›.

**رفت‌وروب** / roft-o-rûb، ـها/: اسم. ۱. کار و ڕەوتی ڕامالین؛ ڕامالان؛ ڕاڕفان ۲. گسک‌وماڵ؛ کار یان ڕەوتی گەسکدان و تۆز تەکاندن ‹روزهای جمعه مشغول رفت‌وروب خانه می‌شد: ڕۆژگەلی هەینی خەریکی گسک‌ومالی خانووەکە دەبوو›.

**رفته‌ـــرفته** / rafterafte/: قید. وردەـــ وردە؛ بەرەـــ بەرە؛ هێدیـــ هێدی؛ کەم‌ــکەم؛ تۆزەـتۆزە؛ هن‌بهن؛ بە تێپەڕ بوونی کات ‹رفته‌ـرفته همه‌ی کارها را به دست گرفت: وردەـ وردە تەواو کارەکانی گرتە دەستەوە›.

**رفراندم** / refrāndom، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [سیاست] کۆمەڵپرسی؛ لێ‌پرسینی گشتی؛ کۆپرسان؛ کار و ڕەوتی پرسی خەڵکی کردن بۆ سەلماندن یان لابردنی قانوونێک.

**رفرانس** / ref(e)rāns/: [فرانسوی] ☜ **مَرجَع-۳**

**رفرم** / reform، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ڕیفۆرم؛ باشتر کردنەوەی دۆخێ کە بەرقەرارە.

**رفرمیست** / reformîst/: [فرانسوی] صفت. چاکەوەخواز.

**رفرمیستی** / reformîstî/: [فرانسوی] صفت. چاکەخوازانە.

**رفع** / raf'/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی:

۱. نەهێشتن ۲. *[ریاضی]* ساغ کردنەوە؛ کاری هەڵاواردنی ژمارەی ساخ لە ژمارەی شکاو ‹اگر ۲/۱۳ را رفع کنیم می‌شود ۲/۱۶: ئەگەر ۲/۱۳ ساغ بکەینەوە دەبێتە ۲/۱٦›.

▣ **رفع ابهام:** نەهێشتنی گرژی و دژواری بابەتێک و ئاشکراکردنی چۆنیەتی ئەو گرێیە.

**رفع تکلیف:** *[مجازی]* کار یا ڕەوتی لە مل کردنەوە؛ لە سەر لادانی کارێک و کەمتەرخەم بوون لە بەرانبەریدا ‹با این آمدنش فقط می‌خواست از خودش رفع تکلیف کرده باشد: بەم هاتنە هەر گەرەکی بوو لە ملی بکاتەوە›.

**رفع توقیف:** *[حقوق]* کار و ڕەوتی ئازاد کردنی کەس یان ماڵێکی زەوت‌کراو.

**رفعت** / raf'at/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. بەرزایی؛ بالایی؛ بڵیندی ۲. هێژایی؛ هەڤیازی؛ سەروانی؛ سەراونی.

**رفع‌ورجوع** / raf'-o-rucû', -rocû'/: [عربی] *اسم.* جێبەجێ؛ کار یان ڕەوتی لابردنی ئالۆزی و بشێوەی بەدیهاتوو.

**رفق** / refq/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. هاوڕێیی؛ هاوڕێتی ۲. دۆستی؛ هەوالی؛ هەمبازی.

**رفقا** / rofaqā/: [عربی] جمعِ ☜ **رَفیق**

**رفو** / rufû, rofû، ـها/: [عربی] *اسم.* هڤێژ؛ هفێز؛ کاری چاک کردنەوە و داپۆشانی دڕاوی و ڕزاوی لە قوماش و هەڵچنراوگەلی تردا بە شێوەی دروونەوەی ئەو جێگانە بە چەشنی پێشوو و بە بەنی هەر بەو ڕەنگە، کە دیار نەبێ.

▣ رفو کردن: هیڤاختن؛ هیڤاستن؛ هیڤاشتن؛ چنینەوە؛ چناندن؛ ڤەچنین؛ وەچناندن؛ ڤەجناندن؛ دڕاو بە هەودا دروونەوە. هەروەها: **رفو شدن**

**رفوزه** / rufûze, rofûze، ـها/: [فرانسوی] *صفت. [گفتاری]* ڕفووزە؛ دۆخ و چۆناوچۆنی قەبووڵ نەبوون و لە جێی خۆدا مانەوە؛ دواکەوتن؛ دەرنەچوون لەوانەدا. هەروەها: **رفوزه بودن؛ رفوزه شدن؛ رفوزه کردن**

**رفوکاری** / rufûkārî, rofû-، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* هڤێژکاری؛ هفێزکاری؛ کار یان ڕەوتی هڤێژ کردنی شتێک.

**رفوگر** / rufûgar, rofû-، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* هڤێژکەر؛ کەسێ کە کاری چاک‌کردنەوەی دڕاوی و پواوی پارچە و چنراوگەلی دیکەیە.

**رفوگری** / rufûgarî, rofû-/: *اسم.* هڤێژکەری: ۱. کاری هفێزکرن ۲. پیشەی هڤێژکەر ۳. کارگەی هفێزکەر.

**رفیده** / rafîde/: *اسم.* ڕفێدە؛ مادە؛ مایە؛ مادێ؛ نان‌بەن؛ کەرەسەیێ لە کولۆش یان شووڵ کە متقالی بە سەردا گیراوە و بۆ نان بە تەنوورەوە دان کەڵکی لێ دەگرن.

**رفیع** / rafî'/: [عربی] *صفت. [ادبی]* بەرز: ۱. بڵند؛ بلیند؛ خاوەن بەرزایەکی زۆر ۲. بەرچاوگر و گرنگ ‹مقام رفیع: پایەی بەرز›.

**رفیق** / rafîq, refîq، ـها؛ ـان؛ رُفَقا/: [عربی] *اسم.* یار؛ هاوباز؛ هامفەرد: ۱. دۆس؛ دۆست؛ دەسەبرا؛ دەستەبرا ۲. هاوتەک؛ هاواڵ؛ هاوڕێ؛ هاوڕا؛ ڕەفیق؛ هالا؛ هاڤاڵ؛ ئاواڵ؛ هاوەڵ؛ هامڕا؛ ئاوەڵ؛ برادەر؛ هەڤاڵ؛ ئاورێ؛ ڕیهەڤ؛ هاواڵ؛ هاودەم؛ هەورێ؛ هەتەک ۳. ڕەفێق (لە زاراوەی ڕێبازی مارکسیسمدا)؛ هاوبیر؛ هاومراز ‹رفیق لنین: ڕەفیق لێنین›.

▣ **رفیق شفیق:** دۆستی دلۆڤان؛ دۆستی دڵسۆز؛ هەڤالۆشک؛ دۆستی بەڕاستی.

**رفیق نیمه‌راه:** نیمچەدۆس؛ ڕەفێق نیمەڕێگە؛ دۆستی سست.

▣ **رفیق آش و پلو کسی بودن:** *[کنایی]* دۆستی سەر سفرەی کەسێک بوون؛ دۆستی مەرامی کەسێک بوون؛ لەگەڵ کەسێکدا بە خاتری دەسکەوت و قازانج دۆستایەتی کردن.

**رفیق بودن:** دۆس بوون؛ هەواڵ بوون. هەروەها: **رفیق شدن**

**رفیق گرفتن:** (لەمەڕ ژن یان کچەوە) دۆس گرتن؛ دڵ گیرتەی؛ بوونە دۆست و ئەویننداری کردن لەگەڵ پیاوێکدا.

**رفیقانه**[1] / rafîqāne, refîqāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دۆستانە؛ دۆسانە؛ هەڤالانە؛ وەک دۆست ‹کمک رفیقانه: یارمەتی دۆستانە›.

**رفیقانه**[2]: *قید.* دۆستانە؛ دۆسانە؛ هەڤالانە؛ وێنەی دۆسان؛ هاوڕێ لەگەڵ دۆستایەتی زۆردا ‹رفیقانه او را در آغوش گرفت: دۆستانە باوەشی پێدا کرد›.

**رفیق‌بازی** / rafîqbāzî, refîqbāzî، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* دۆسبازی؛ دۆستبازی: ۱. زێدەڕۆیی لە دۆستایەتی کردن و بوونە ڕەفیق لەگەڵ خەڵکدا ۲. دۆستان لە هەر کارێکدا سەر خستن و لە بەر ئەوان حەق نانە لاوە ۳. (لەمەڕ ژن یان کچەوە) کار یا ڕەوتی دامەزراندنی پێوەندی خۆشەویستی لەگەڵ پیاوێکدا. هەروەها: **رفیق‌باز**

**رفیقه** / rafîqe, refîqe، ـها/: [عربی]/*اسم.* دۆس؛ کچ یان ژنێک کە لەگەڵ پیاوێکدا خلێنەوبلێنەی هەبێ.

**رقابت** / reqābat, raqābat، ـها/: [عربی]/*اسم.* هاڤڕکێ؛ هەڤڕکێ؛ ڕکەبەرکێ؛ ڕقبەرقە؛ بەربەرەکانێ؛ ڕکە؛ ملە؛ مل‌ملانێ؛ کێبەرکێ؛ هەڤدوبرن؛ کار یا ڕەوتی کۆشان بۆ پێشکەوتن لە کارێک یان بە دەستهێنانی شتێک کە جێگای سەرنجی هەمووانە ‹برای جلب توجه آن دختر با هم رقابت می‌کردند: بۆ ڕاکێشانی سەرنجی ئەو کچە پێکەوە هاڤرکێیان دەکرد›. هەروەها: **رقابت داشتن؛ رقابت کردن**

**رقاص** / raqqās، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم.* سەماکەر؛ داوەتگێڕ؛ کای‌کەردۆخ؛ لیزەڤان: ۱. کەسێ کە بە هەڵپەڕکێ و سەما سەرنجی کەسان بۆ لای خۆ دەبا ۲. کەسێ کە لە هەڵپەڕکێدا کارامەیە.

**رقاصک** / raqqāsak، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* بەندۆل؛ لەرزان؛ ئامرازێک لە کاتژمێردا کە بە هاتوچۆی یەکمیزانی بەرەو چەپ و ڕاست، دەبێتە هۆی زایەڵەدار بوونی دەنگ و هێدی بوونەوەی فەنەری سەعات.

**رقاصه** / raqqāse، ـها؛ ـگان/: [عربی]/*اسم.* هەڵپەڕکێ‌کەر؛ ژنێ کە کاری هەڵپەڕینە.

**رقاصی** / raqqāsî، ـها/:*اسم.* ۱. کار یان ڕەوتی هەڵپەڕکێ کردن ۲. کاری هەڵپەڕکێ‌کەر.

**رقاع** / reqā'/: [عربی]/*اسم.* یەکێک لە خەتگەلی عەرەبی کە لە ڕابردوودا لە نووسینی فارسیشدا بەکار دەچوو و زۆرتر لە کەتیبە، فرمان و سەردێڕی پەرتووکاندا بەکار دەبرا.

**رقبا** / roqabā/: [عربی] جمعِ ☜ **رقیب**

**رقبات** / raqabāt/: [عربی] جمعِ ☜ **رَقَبه**

**رقبه** / raqabe، رقبات/: [عربی]/*اسم.* ملک یان زەوی و زاری بەخشراو بە شوێن یان دامەزراوەیێک.

**رقت** / reqqat/: [عربی]/*اسم.* ۱. تەڕی (بەرامبەری خەستی)؛ دۆخ یان چۆنیەتی تەڕ و بڕ بوون ۲. *[مجازی]* ناسکی ۳. *[مجازی]* تورتی؛ شکێنەری.

▣ رقت قلب: ۱. دڵناسکی ۲. خەم و کەسەرێ کە بە هۆی دیتنی ئازاری خەڵکی‌ترەوە دڵ دادەگرێ.

**رقت آور** / reqqatāvar/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دڵتەزێن؛ هۆی خەمبار کردن و دڵتەزاندن.

**رقت‌انگیز** / reqqatangîz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دڵتەزێن؛ هۆی خەفەتبار کردن و دڵ هێنانە ڕەحم ‹حال رقت‌انگیزی داشتم: دۆخێکی دڵتەزێنم هەبوو›.

**رقت‌بار** / reqqatbār/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دڵتەزێن؛ هۆی بەدیهاتنی جەخار و دڵ تەمراوی ‹آمدی و زندگی رقت‌بار او را دیدی: هاتی و ژیانی دڵتەزێنی ئەوت دی›.

**رقص** / raqs، ـها/: [عربی]/*اسم.* هەڵپەڕکێ؛ سەما؛ کای؛ دیلان؛ لیز؛ لۆتک؛ قنجێ؛ ئورزان؛ هۆرپڕای؛ هۆرپڕەی؛ لەیس؛ لەیز؛ هەلای؛

ڕەخس؛ کۆمەڵەیەک زیویانی بەزمین، پتر لەگەڵ مووسیقادا.

▣ **رقص شتری:** *[کنایی]* لۆقە؛ سەمای بە نابەڵەدی.

**رقص نور:** ئامرازێکە زۆری چرا تێدایە، کە تیشکیان کەم و زیاد دەکا و کزی و بەرزی دەنگ دەنوێنێ.

**رقصان**[1] / raqsān/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بەدیلان؛ بەلەیزان؛ بە چۆناوچۆنی سەماوە ‹شعلەی رقصان آتش: گڕی بەدیلانی ئاگر›.

**رقصان**[2]: *قید.* بە سەماوە؛ لە حاڵی هەڵپەڕیندا ‹خندەزنان و رقصان گرد سالن می‌چرخیدند: بە پێکەنین و سەماوە لە سالۆنەکەدا دەسووڕانەوە›.

**رقصاندن** / raqsāndan/: [عربی/ فارسی] *مصدر. متعدی.* // **رقصاندی:** هەڵتپەڕاند؛ **می‌رقصانی:** هەڵدەپەڕێنی؛ **برقصان:** هەڵپەڕێنە// ۱. هەڵپەڕاندن؛ هەڵپەڕانن؛ هۆرپڕنەی؛ بە لەیز هەڵپێچاندن ‹داشت عروسک را می‌رقصاند: خەریک بوو بووکەڵەکەی هەڵدەپەڕاند› ۲. *[کنایی]* هەڵسووڕاندن؛ هەڵپەلە پێ‌کردن؛ هۆرخولنەی؛ بە درۆ و دەلەسە بە کارگەلی گۆترەوە هەڵپێچاندن ‹دو سال است مرا با این دروغها می‌رقصانی: دوو ساڵە بەم درۆیانە هەڵم دەسووڕێنی›. **رقصانیدن.** هەروەها: **رقصاندنی**

■ صفت فاعلی: **رقصاننده** (هەڵپەڕێنەر)/ صفت مفعولی: **رقصانده** (هەڵپەڕێنراو)/ مصدر منفی: **نَرقصاندن** (هەڵنەپەڕاندن)

**رقصانیدن** / raqsānîdan/: [عربی/ فارسی] ☜ **رقصاندن**

**رقصنده** / raqsande، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* هەڵپەڕکێ‌کەر؛ سەماکەر؛ کەسێ کە هەڵدەپەڕێ.

**رقص‌نگاری** / raqsnegārî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کار و ڕەوتی دانانی شێوەی سەما، بەتایبەت باڵە.

**رقصیدن** / raqsîdan/: [عربی/ فارسی] *مصدر. لازم.* // **رقصیدی:** هەڵپەڕیت؛ **می‌رقصی:** هەڵدەپەڕی؛ **برقص:** هەڵپەڕە// ۱. هەڵپەڕان؛ هەڵپەڕین؛ هۆرپڕەی؛ هۆرپڕای؛ ڕەخسین؛ لەهەستین؛ لیزین؛ لەیزتن؛ وازین؛ سەما کردن؛ مەشاندنی دیلان ‹حاضران با آهنگ دُهُل می‌رقصیدند: ئامادەبوان بە ئاهەنگی دەوڵ هەڵدەپەڕان› ۲. *[مجازی]* هەڵسووڕان؛ هۆرخولیەی؛ ئەنجامدانی کارگەلێ بە دڵخوازی دیتری و بێ‌ویستی خۆ ‹بە ساز دیگری رقصیدن: بە فووی دیتران هەڵسووڕان›.

■ صفت فاعلی: **رقصنده** (سەماکەر)/ صفت مفعولی: **رقصیده** (سەماکردوو)/ مصدر منفی: **نَرقصیدن** (سەما نەکردن)

**رقعه** / roq'e، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. نامە؛ نووسراوە ۲. شێوە نووسینێکی خەتی عەرەبی ۳. *[قدیمی]* پینە.

**رقعی** / roq'î/: [عربی] ☜ قطع رقعی، **قطع**

**رقم** / raqam/: [عربی] *اسم.* ۱. نووسراوە ۲. ـها؛ اَرقام؛ رُقوم/ ژمارە؛ هەر یەک لە نیشانەگەلی دەیانەی (۱تا ۹و ۰) لە ژمارەنووسی باودا.

▣ **رقم زدن:** نووسین؛ نڤیسین؛ نویستەی؛ نویسەی.

**رقوم** / ruqûm, roqûm/: [عربی] جمعِ ☜ **رَقَم**

**رقومی** / ruqûmî, roqûmî/: [عربی] *صفت.* ژمارەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ژمارەوە.

**رقیب** / raqîb، ـها؛ ـان؛ رُقَبا/: [عربی] *اسم.* هومال؛ هاوچاو؛ بەربەرەکانێ‌کەر؛ هاڤرک؛ هەڤرک؛ ملەکەر؛ ململانێ‌کەر؛ هەر کام لەو کەسانەی کە بۆ گەیشتن بە ئامانجێک بە دووی کەوتنە بەر لە کەسانی‌ترن.

▣ **رقیب تراشیدن:** هومال سازدان؛ هاوچاو تاشین؛ بوونە هۆی پەیدا بوونی هاڤرک.

**رقیت** / reqqîyyat/: [عربی] *اسم. [ادبی]* کۆیلەیی؛ کۆیلەتی؛ کۆلەتی؛ لێزیەتی؛ بەندەیی.

**رقیق** / raqîq/: [عربی] *صفت.* کەمڕەنگ؛

ناخەس: ۱. کاڵ؛ ئاوەکی؛ تەڕ؛ شل ‹چای رقیق؛ رنگ رقیق: چای کەمڕەنگ؛ ڕەنگی تەڕ› ۲. بە ڕەنگی کەمەوە ‹آرایشی رقیق کرده بود: ئاڕایشێکی کاڵی کردبوو›.

**رقیق‌القلب** / raqîqolqalb/: [عربی] *صفت.* دڵناسک؛ دڵ‌هلوو؛ دڵنەرم.

**رک**[1] / rok/: *صفت.* *[گفتاری]* ڕەپ و ڕاست؛ سەراقکی؛ وەکات؛ هەربی؛ سفت و سادە؛ بێ‌ڕووبینی؛ بێ‌پەردە؛ خاوەن ڕاشکاوی و ڕاستی لە دەربڕینی ئەوەی دڵخوازی بیسەر نیە ‹آزاد خیلی رک بود و راحت حرفش را می‌زد: ئازاد زۆر ڕەپ و ڕاست بوو، ڕەحەت قسەی خۆی دەکرد›.

**رک**[2]: *قید.* بە ڕاشکاوی؛ بێ‌دەراویسی؛ ڕەپ و ڕاست؛ ڕەپ و ڕەوان؛ پان بە پان؛ ڕەپا و ڕەپ؛ بێ ڕووبینی؛ دەق و دەق ‹خیلی رک به من گفت: نمی‌خواهم با ما بیایی: زۆر بە ڕاشکاوی پێمی گوت: نامەوێ لەگەڵماندا بێی›.

**رکاب** / rekāb ، ـها/: [عربی] *اسم.* ۱. ئاوزەنگی؛ زەنگوو؛ زنگی؛ وزەنگی؛ ویزەنگی؛ زەنگ؛ مەنەک؛ ڕکێف؛ ئاڵقەی نیوە جەغزی ئەملا و ئەولای زین کە لە کاتی سواریدا پێی تێ دەخەن ۲. جێی پا لە دووچەرخە و موتۆڕدا ۳. پلەی ماشین و قەتار کە لە کاتی سوار بووندا پێی لە سەر دەنێن ٤. پارچەنەواری هەڵواسینی شالوار لە سەر شان.

▣ **رکاب دادن**: ۱. سواری دان ۲. *[کنایی]* بەر فەرمان بوون.

**رکاب زدن**: پاڵێدان؛ دووچەرخە ئاژۆتن.

**رکاب کشیدن**: بە تاو بردن؛ لنگاردن؛ لنگ‌دان؛ بە قیر هەڵپێچان.

**رکاب گرفتن**: پەنجە هەڵپێکان و دوو دەست بە شێوەی ئاوزەنگی دەرهێنان بۆ پا تێ خستن و سەرکەوتنی کەسێکی‌تر.

**در (التزام) رکاب کسی بودن**: *[مجازی]* وێڕای گەورەیەک بۆ شوێنێک چوون؛ هاوڕێی کەسێکی گەورە بوون.

**رکابدار**[1] / rekābdār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* پێشەنگ؛ کەسێ کە لە پێش سوارەوە بە پیادە دەڕوا و لە سوار بوون و دابەزیندا یارمەتی دەدا.

**رکابدار**[2]: *صفت.* ۱. ☜ **رکابی** ۲. مەنەکدار؛ خاوەن مەنەک ‹ماشین رکابدار: ماشینی مەنەکدار›.

**رکابی** / rekābî/: [عربی] *صفت.* ۱. ڕکابی؛ خاوەنی ڕکاب ‹پیراهن رکابی: کراسی ڕکابی› ۲. مەنەکی؛ مەنەکدار؛ وەکوو مەنەک ‹استخوان رکابی: ئیسقانی مەنەکی›.

**رکاکت** / rekākat, rakākat/: [عربی] *اسم.* نەچیێی؛ ناپەسندی؛ دزێوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەچێ بوون.

**رکتوم** / rektom/: [فرانسوی] *اسم.* *[کالبدشناسی]* ڕیخۆڵەی کۆم؛ بەشی دوایی ڕێڵەخۆی گەورە.

**رکعت** / rak'at, rek'at, rok'at ، ـها/: [عربی] *اسم.* *[اسلام]* ڕکات؛ ڕەکات؛ ڕەکاتە؛ پاژێک لە نوێژ، بریتی لە وەستان، خوێندنی ئایەت وسوورە لە قورئان، دانەوان و سەر نانە زەوی.

**رک‌گویی** / rokgûyî ، ـها/: *اسم.* زمان‌ڕووتی؛ قسەڕووتی؛ وەکات‌واچی؛ کار یان چۆناوچۆنی بە ئاشکرا و بێ‌مەرایی قسە کردن؛ ڕووت و پەتی وتن ‹رک‌گویی همه‌جا خوب و نیست و گاهی کار دست آدم می‌دهد: زمان‌ڕووتی هەمیشە باش نیە و زۆرجار مرۆ تووش دەکا›.

**رکن** / rokn ، ـها؛ ارکان/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* کۆڵەکە: ۱. ئەستوون؛ ئەستوونگ؛ پایە؛ کۆڵەکێ. ۲. *[مجازی]* هۆی ڕاوەستاوی شتێک ‹مطبوعات را رُکن سوم دمکراسی می‌دانند: ڕۆژنامەگەل بە کۆلەکەی سێهەمی دوموکراسی دەزانن›.

**رکود** / rokûd/: [عربی] *اسم.* مەندی؛ نەجوولان؛ بێ جهشت بوون؛ خەفتن؛ کار و ڕەوتی داوەستان.

**رکورد** / rekord، ـها/: [انگلیسی و فرانسوی] *اسم.* ڕیکورد؛ بانترین شۆپ یان ئەندازە (لە چۆنی یان چەندی) کە بە هۆی کارێکەوە دەس کەوێ.

▣ **رکورد به دست آوردن:** ڕیکورد هێنان؛ بە دەس هێنانی بانترین شۆپ یان ئەندازە.

**رکورد شکستن:** ڕیکورد شکاندن؛ بردنە سەرەوەی بانترین ڕادەی پێشوو.

**رکورد گرفتن:** ڕیکورد گرتن؛ تاقی کردنەوەی توان بۆ گەیشتن بە بانترین شۆپ یان ئەندازە.

**رکوردار** / rekord.dār، ـها؛ ـان/: [انگلیسی و فرانسوی/ فارسی] *صفت.* ڕیکورددار؛ خاوەنی بانترین شۆپ.

**رکوع** / rukû', rokû'، ـها/: [عربی] *اسم. [اسلام]* ڕکووع؛ بەشێ لە نوێژ لە هەر ڕەکەتدا کە نوێژخوێن دادەنەوێ و دەست لە سەر ئەژنۆی دەنێ و ڕستەیەکی پەسنی خودا دەڵێ.

**رکیک** / rakîk/: [عربی] *صفت.* پیس؛ دزێو؛ پەلەشت؛ بێ‌حوزم؛ ناماقووڵ و هۆی نەمانی شەرم و شوورەیی ‹حرف رکیک: قسەی پیس›.

**رگ** / rag، ـها/: *اسم.* ۱. ڕەگ؛ ڕەی؛ ڕێ؛ ڕیتگە؛ گیڤ؛ ڕەهی باریک و ناسک لە مۆرغەداراندا کە خوێن دەگەینێتە قەلب ۲. *[مجازی]* غیرەت ‹فکر نمی‌کردم اینقدر بی‌رگ باشد: پێم وانەبوو ئەوەندە بێ‌غیرەت بێ› ۳. ڕەگ؛ باریکە؛ شوێنە باریکە.

▣ **رگ خونی:** ۱. سوورەدەمار ۲. دەماری ڕەش؛ ڕەشەڕەگە ۳. ڕەگە مووینە؛ باریکەدەمار.

**رگ لنفی:** ڕەپیسک؛ ڕەخیسک؛ ڕەگی سپی یا ئاوەندی لەنفی کە تراوی لەنفی تێدا دەگەڕێ.

▣ **رگ به رگ شدن:** ڕەگاوڕەگ بوون؛ ڕێ‌گێلەی؛ تاکولۆ کەوتنی ماسوولکەی لەش، بەهۆی تەوژمی زۆرەوە ‹خم شدم چمدان را بردارم، کمرم رگ‌به‌رگ شد: دانەویم جانتاکە هەلگرم، پشتم ڕەگاوڕەگ بوو›.

**رگ خواب کسی را به دست آوردن:** *[مجازی]* لایەنی کەمایەسی کەسێ دۆزینەوە و کەلک لێی وەرگرتنی.

**رگ خود را زدن:** لە ڕەگی خۆ دان؛ خۆ کوشتن؛ خۆ مراندن؛ ڕێو وێ بریەی.

**رگ دیوانگی کسی گل کردن:** *[مجازی]* بەسەردا هاتن؛ دان لە سەر؛ لە بەر تووڕەیی زۆر، وەکوو شێت لێهاتن و ئاکاری سەیر لێ بوونەوە ‹مثل این که باز رگ دیوانگی تو گل کرده که این طور داری نعره می‌کشی: وادیارە دیسان بە سەرتدا هاتووە ئاوا دەقیڕێنی›.

**رگ زدن:** ۱. بڕین یان دڕاندنی ڕەگ ‹تا رسیدند رگ خودش را زده بود: تا گەیشتن، ڕەگی خۆی بڕیبوو› ۲. خوێن‌بەردان؛ حەجامەت.

**رگ غیرت کسی جنبیدن:** غیرت کسی به جوش آمدن ☜ **غیرت**

**رگ کردن پستان:** ڕەگ پێدا هاتن؛ شیر زانە سینەی ژن.

**رگ گردن کسی بیرون آمدن:** *[کنایی]* خوێن هاتنە بەرچاو؛ زۆر تووڕە بوون؛ ڕەگ مل بەرزەو بوون/ دەرپەڕین.

**به رگ غیرت کسی برخوردن:** *[مجازی]* لە ڕەگی غیرەتی کەسێک دان؛ غیرەت جمانی کەسێک بە هۆی بزواندنەوە ‹حرف من به رگ غیرتش برخورد و کتاب را پس داد: قسەکەم لە ڕەگی غیرەتی دا و کتێبەکەی داوە›.

**رگبار** / ragbār، ـها/: *اسم.* ڕێژنە؛ ڕەژنە؛ گوزم؛ خوڕڕەم: ۱. ڕهێلە؛ ڕەهێلە؛ ڕەهێڵ؛ شەس؛ شەست؛ شەستە؛ تاوە؛ لیزمە؛ لیزم؛ ئاژ؛ هرشت؛ شەماڵە؛ بارینی پڕتاو و لەنکاو کە گەلێک جار دەگەڵ بازریشک و بادەوەدایە ۲. دەسرێژ؛ دەستڕێژ؛ ڕەگبار؛ تیرهاوێژی ڕەمارەم و بێ‌وچان. بەرانبەر: **تک‌تیر**

▣ بە رگبار بستن: دەسڕێژ کردن؛ گوللە هاویشتنی پەیتا-پەیتا و بێوچان بەرەو کەس یان شتێک.

**رگبرگ** / ragbarg ، ـها/: اسم. دارک؛ ڕەگە و ڕیشاڵەی پشت گەڵا؛ هەر کام لە دەستەگەلی باریکەڕەگی سەر گەڵا.

**رگبند** / ragband ، ـها/: اسم. ڕەگبەس؛ ئامێرێ بۆ بەستنی سوورەڕەگێکی لەش، کە لوولەیەکی لاستیکی باریکە بە قولاپێک لە سەریەوە: **شریان‌بند؛ گارۆ**

**رگبندی** / ragbandî/: اسم. [زیست‌شناسی] ۱. چۆنیەتی ڕیزبەندی و تێکەڵاوی ڕەگە و ڕیشاڵە لە گەڵادا ۲. چۆناوچۆنی دارێژانی ڕەگە و ڕیشۆڵەی باڵی مێروان.

**رگبی** / ragbî/: [انگلیسی] ☜ **راگبی**

**رگ‌شناسی** / ragšenāsî/: اسم. ڕەگناسی؛ زانستی خۆندنەوە و لێکۆڵینەوە لەمەڕ ڕەگ و پەی و کۆئەندامگەلی پێوەندیدارەوە.

**رگل**[۱] / regl/: [فرانسوی] اسم. بێنوێژی؛ نەخۆشی مانگانەی ژنان.

**رگل**[۲]: صفت. بێنوێژ؛ تووشیاری نەخۆشی مانگانە.

**رگلاتور** / reg(û)lātor ، ـها/: [از فرانسوی] اسم. ڕیگلاتۆر؛ ئامێری ڕێککردن و ڕێکخستنی کەرەستەیەک.

**رگلاژ** / reglāj/: [فرانسوی] اسم. ڕیگلاژ؛ کار یان ڕەوتی ڕێککردنی کەرەسەیەک بۆ ئەوەی باش کار بکا.

**رگ‌نگاری** / ragnegārî/: اسم. [پزشکی] کار و ڕەوتی وێنەگرتن لە دەمارگەلی لەش دوای وەشاندنی ماکی تایبەت.

**رگ‌وریشه** / rag-o-rîše/: اسم. ۱. [ـها] پنج و ڕەگ؛ دەمار و بنەکۆکی گۆشت ۲. [مجازی] بنەچە؛ بنەچەگە؛ باب و باپیران؛ بنچین؛ بنچن؛ ڕەگ و ڕیشە؛ بنج و بناوان؛ ڕەچەڵەگ؛ توو و تۆرەمە ‹آزاد رگ و ریشه‌ی او را هم می‌شناخت: ئازاد بنەچەشی دەناسی›.

**رگه** / rage ، ـها/: اسم. ۱. ڕەگ؛ نەخش یان شۆپێکی ڕەگئاسایی ۲. [زمین‌شناسی] ڕەگە؛ ڕینج؛ کارەی ناو زەوی؛ چینی جیاوازی ناو خاک و بەرد ‹رگه‌ی طلا: ڕەگەی زێڕ› ۳. ڕەگە؛ نژاد؛ نەژار؛ بنچینە ‹دو رگه: دوورەگە› ٤. [مجازی] شوێن؛ شۆپ؛ شوێنەوار؛ شۆنەما؛ ڕینج ‹در سخنانش رگه‌ای از غم و اندوه احساس می‌شد: لە قسەکانیدا شوێنێک لە خەم و کەسەر هەست پێدەکرا›.

**رل** / rol ، ـها/: [فرانسوی] اسم. ۱. فەرمانی ماشێن ‹پشت رل: پشت فەرمان› ۲. دەور؛ نەخش لە شانۆ یان فیلمدا ‹در این فیلم رُل رئیس‌جمهور را بازی می‌کند: لەم فیلمەدا نەخشی سەرۆک کۆمار دەگێڕێ›.

**رله** / rele ، ـها/: [فرانسوی] اسم. ۱. کەرەسەیەک بۆ بەهێزکردنی پێلگەلی دەنگی ۲. کەرەسەی دووپاتکەرەوەی دەنگ و ڕەنگ.

**رم** / ram/: اسم. ۱. ڕەم؛ ڕەڤ؛ ڕەو؛ سڵ؛ سڵەمە؛ سڵم؛ سەڵم؛ کار یان ڕەوتی سڵەمان ۲. ڕان؛ گەلە.

▣ رم دادن: سڵەماندن؛ ڕەم دان؛ ڕەواندن ‹صدای تیر، اسب را رم داد: دەنگی تیر ئەسپەکەی سڵەماند›.

رم کردن: سڵ کردن؛ سڵەمان؛ سڵەمینەوە؛ ڕەڤ کرن؛ ڕەوینەوە؛ پەرموون؛ گورگە بوون؛ سڵ بوون؛ هەڵترنگان؛ هەڵتووران؛ هەڵتووزان ‹اسب رم کرد و او را زمین زد: ئەسپەکە سڵی کرد و دایخست›.

**رم** / rom/: [فرانسوی از انگلیسی] اسم. ڕوم؛ جۆرێک شەراوی شیرین.

**رماتیسم** / romātîsm/: [فرانسوی] اسم. ڕوماتیسم؛ ژان و ژوو؛ نەخۆشی جومگە؛ ژانی بەندی ئێسک؛ زاراوەیێ بۆ تاقمێکی جیاواز لە

نەخۆشیگەل کە لایەنی هاوبەشی هەموویان ئالۆزی و ئێش، سفتی و ماسینی ماسوولکە و جومگەگەلی لەشە: **روماتیسم**

**رماتیسمی** / romātîsmî/: [فرانسوی] *صفت.* روماتیسمی: ١. پێوەندیدار بە نەخۆشی جومگەوە ٢. تووشیاری نەخۆشی جومگە.

**رمال** / rammāl ، ـها؛ ـان/: [عربی] /*اسم.* خیرە؛ فالچی؛ تالحبین؛ فالوێژ؛ فالگرەوە؛ ئەوەی کە بە رەمڵ دەیەوێ رازی سەربەمۆر ئاشکرا بکا.

هەروەها: **رمّالی**

**رمان** / romān ، ـها/: [فرانسوی] /*اسم.* رومان؛ چیرۆکی درێژ؛ چیرۆکە پەخشانێک کە لە رووداوگەلی ژیانی مرۆڤ هۆنراوەتەوە.

▣ رمان پلیسی: رومانی پولیسی؛ حیکایەتی مرۆ کوژی و دزی و شوێنگرتنی پولیس بۆ دەرخستنی راستی رووداو.

رمان تاریخی: رومانی مێژوویی؛ رومانێ کە قارەمانەکانی کەسایەتی مێژووین یان سەبارەت بە رووداوێکی مێژووییەوە نووسراوە.

هەروەها: **رمان جاسوسی؛ رمان عشقی**

**رمانتیسم** / romāntîsm/: [فرانسوی] ☜ **رمانتی‌سیسم**

**رمانتی‌سیسم** / romāntîsîsm/: [فرانسوی از ایتالیایی] /*اسم.* رومانتی‌سیسم؛ بزووتنەوەیەکی وێژەیی و شێوازێکی هونەری و فەلسەفیە کە لە چەرخی هەژدەهەمی زایینی لە ئورووپای رۆژاوادا سەری هەڵدا و باسی لە هەست و نەست و خەیاڵ و خۆشەویستی دەکرد و کار و باری سروشتی و ژیانی خەڵکی ئاسایی پیشان‌دەدا: **رومانتیسم**

**رمانتیک** / romāntîk/: [فرانسوی] *صفت.* رومانتیک؛ هەستبزوێن: ١. هاوگەری رومانتی‌سیسم ‹سبک رمانتیک: شێوازی رومانتیک› ٢. ـها/ هەستیار؛ هەستۆکی و خەیالاوی ‹تو خیلی رمانتیک هستی: ئەتۆ زۆر رومانتیکی› ٣. بە تایبەتمەنی و چۆناوچۆنی بزواندنی خەیاڵ و هەستی خۆشەوە ‹منظرەی رمانتیک: دیمەنی رومانتیک› ٤. بە ناوەرۆک و چۆناوچۆنیەکی هەستۆکی یا ئەویندارانەوە ‹زندگی رمانتیک: ژیانی رومانتیک›.

**رماندن** / ramāndan/: *مصدر. متعدی.* // **رماندی:** رەواندت؛ **می‌رمانی:** دەرەوێنی؛ **برمان:** برەوێنە// رەواندن؛ رەواندنەوە؛ وەرامەنە؛ ڤەتریسکاندن؛ ڤەترووییسکاندن؛ دەرپەڕاندن؛ رەڤاندن؛ هەڵترنگاندن؛ هەڵتووراندن؛ هەڵتۆزاندن؛ هەڵتیزاندن؛ هەڵجووزاندن؛ هەڵفڕاندن؛ هەڵفرتاندن؛ تارنیەی؛ رەمنای؛ ترساندن و تاراندن (بەتایبەت سەبارەت بە گیانەوەرانەوە): **رمانیدن**

■ صفت مفعولی: **رمانده** (رەوێنراو)/ مصدر منفی: **نَرماندن** (نەرەواندن)

**رمانیدن** / ramānîdan/ ☜ **رماندن**

**رمباندن** / rombāndan/: *مصدر. متعدی.* // **رمباندی:** رماندت؛ **می‌رمبانی:** دەرمێنی؛ **بِرمبان:** برمێنە// رماندن؛ رووخاندن؛ ورنەی؛ ورنای؛ وێران کردن؛ دیوار یان ماڵێک هاوردنە خوارەوە.

■ صفت مفعولی: **رمبانده** (رمێنراو)/ مصدر منفی: **نَرمباندن** (نەرماندن)

**رمبیدن** / rombîdan/: *مصدر. لازم.* // **رمبیدی:** رمای؛ **می‌رمبی:** دەرمی؛ **بِرمب:** برمە// رمیان؛ رمان؛ رووخان؛ رووخیان؛ وریەی؛ وریای؛ وێران بوون؛ هاتنە خوارەوەی دیوار یان ماڵێک.

■ صفت فاعلی: **رمبنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **رمبیده** (رماو)/ مصدر منفی: **نَرمبیدن** (نەرمان)

**رمپ** / ramp ، ـها/: [انگلیسی] /*اسم.* ١. لێژایی؛ لێژی؛ سەرەولێژی؛ شیوەڕێ ٢. پەیژەی فڕۆکە، کە جێبەجێ دەکرێ.

**رمز** / ramz ، ـها؛ رموز/: [عربی] /*اسم.* رەمز: ١. کۆمەڵە نیشانە، ئەژمار، ئاماژە یان وتە و

وشـــەگەلێکی ڕەچـــاوکراو بـــۆ دامەزرانـــدنی پەیوەندی یان گۆڕینەوەی پەیام بە نهێنی ‹نامە را بە رمز نوشتە بود: نامەکـەی بـە ڕەمـز نووسـیبوو› ۲. ڕازی دەسـکەوتنی شـتێ یـان شـێوەی جێبەجێکردنی کارێک ‹رمز موفقیت در امتحان: ڕەمزی سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەدا›.

▣ **رمز چیزی را گشودن:** سەر دەرکردن لە شتێک: ۱. دەرخستنی ڕاستەقینەی شتێکی پەنامەکی ۲. دۆزینەوەی ڕەمزی شتێ؛ پێزانین.

**رمزگشا** / ramzgošā/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بە تایبەتمەندی یان توانایی کردنەوەی ڕەمزەوە.

**رمزگشایی** / ramzgošāyî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ۱. دۆخ یـان چۆنـاوچۆنی هـەبوونی توانـایی دۆزینـەوەی ڕەمـز و چارەسـەری کـاری دژوار ۲. کار یان ڕەوتی ڕەمز کردنەوە یـان ڕەمـز بـاز کردن.

**رمـزی** / ramzî/: [عربی] *صفت.* ڕەمـزی ‹قفـل رمزی: قولفی ڕەمزی›.

**رمزینه** / ramzîne/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* بـارکود؛ نوانە؛ نیشانەیەک برێتی لە چەند هـێڵ و ژمـارە بە سەر بەستەی کەلپەلەوە.

**رمـضان** / ramazān/: [عربی]/*اسم.* ڕەمـەزان؛ مانگی نۆهەمی ساڵی کـۆچی ــ مـانگی و کـاتی ڕۆژوو گرتنی موسوڵمانان.

**رمق** / ramaq/: [عربی]/*اسم.* هێز؛ تابشت؛ تاقەت؛ پرزە؛ نەوا؛ ئاه ؛ هازی؛ ئاز؛ نز؛ نرگ؛ هازی؛ وزە؛ تەشە.

▣ **رمق چیزی را گرفتن:** هێز لە شـتێ سـاندن؛ پرزە لە شتێک بڕین.

**رمق داشتن:** هێز تێدا مان؛ هازی چنە بیەی.

**از رمـق افتـادن:** لـە پـا کـەوتن؛ پـرزە بـڕان؛ نەفەس چنیان؛ بێهێز کەوتن؛ هاز نەمان؛ جە هاز کەوتەی.

**رمل** / ramal/: [عربی]/*اسم.* ڕەمـەل؛ کێـشێکی شیعری عەرووزی.

**رمل** / raml، ـها/: [عربی]/*اسم.* ۱. ڕیـخ؛ ڕێـخ؛ چەو؛ لم؛ زیخ؛ ڕەمڵ؛ ڕەلم ۲. ئـامرازی فالـچی ۳. فووک و فەنی کاری تاڵحبین.

**رموز** / rumûz, romûz/: [عربی] جمعِ ☜ **رَمز**

**رموک** / ramûk/: *صفت. [گفتاری]* سلی؛ ڕەوەک؛ قوشقی؛ واپۆک؛ بەیـدەس؛ چـەمووش؛ گورگـە؛ قوت؛ ڕەمکـار؛ ڕەمـەن؛ چـلەک؛ تـۆڕ؛ قاچـاخ؛ سول؛ سرک؛ جەبە؛ جۆنگ؛ سلک؛ سرگ؛ سرِد؛ خۆگرتوو بە سڵکردن.

**رمـه** / rame، ـها/:/*اسم.* ڕەڤـە؛ ڕێوینـگ؛ ڕان؛ ڕیـەن؛ ڕێیـەن؛ ڕێـن؛ کـەرک؛ مێگـەل؛ گەلـە؛ شەگەل؛ شەگەلە؛ بـۆل؛ پـۆل؛ کۆمەلـی ئـاژەل بەتایبەت بزن و مر.

▣ **رمـەی اسـب:** ڕەوە؛ ڕەوکـە؛ ڕەوگـە؛ ڕەوگ؛ ڕەڤە؛ ڕەڤۆ.

**رمەی برّە:** بەرغەل؛ بەرخەل؛ گەلە بەرخ.

**رمەی خوک:** لۆدە؛ ڕەوە بەراز.

**رمەی گاو:** گاگەل؛ گەلەگا؛ گەلەگاگەل.

**رمەی گرگ:** وەرگان؛ گەلەگورگ.

**رمەبان** / ramebān/:/*اسم.* ڕەوکەوان؛ ڕەوگەوان؛ ڕەووان؛ گەلەوان.

**رمەیار** / ramyār/:/*اسم.* شوان؛ شڤان؛ ئاگـاداری ئاژەل.

**رمیدگی** / ramîdegî/:/*اسم.* سلی؛ ڕەوەکیەتی.

**رمیـدن** / ramîdan/: *مـصدر. لازم.* // **رمیـدی:** ڕەویای؛ **می‌رمی:** دەڕەوی؛ **برم:** بڕەوە// ۱. ڕەویـان؛ ڕەویـن؛ سـڵەوینەوە؛ سـڵەمینەوە؛ سـڵەمانەوە؛ سەڵەمیانەوە؛ ڕەمنای؛ سرِدین؛ ڤەترووویـسکیان؛ ڤەترووویـسکین؛ هەڵـفرتیان؛ هەڵـفریتان؛ هەڵترنگان؛ هەڵتووڕان؛ هەڵتۆزان؛ هەڵـجووزان؛ هەڵتیزان؛ هەڵجووزین؛ سلکین ‹از گرگ رمیدن: لە گورگ ڕەویان› ۲. لادان؛ خـۆ لـێ لادان؛ بێـز کردن لە شتێ و خۆ لێ دوور خستنەوە ‹بە خاطر سابقەاش همە از او می‌رمیدند: لە بەر پێشینەی گـشت

لابان لێ نەدا›.

■ صفت فاعلی: **رمنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **رمیده** (ڕەویاگ)/ مصدر منفی: **نَرمیدن** (نەڕەویان)

**رمیده** / ramîde/: *صفت.* ١. تۆراو؛ زیزبوو؛ تۆریاگ؛ دڵئێشاو ‹دل رمیده: دڵ تۆراو› ٢. هەڵوەدا؛ ڕەویو؛ تار؛ تاربووگ؛ هەتڵە؛ هەلاتوو ‹رمیده از عطَش سُرخ آفتاب کویر: هەڵوەدا لە تینی سووری خۆری سارا›.

**رنج** / ranc ، ـها/: *اسم.* کەزلاتەی: ١. ڕەنج؛ ئەمەک؛ ئازار؛ لارە؛ کەسەر؛ مەینەت؛ دۆخێ کە بە هۆی ئێش، خەم و مەینەت یان کاری دژوارەوە بەدیدێ ‹رنج سفر؛ رنج کار: ئازاری سەفەر؛ ڕەنجی ئیش› ٢. ژان؛ کوێرەوەری؛ خەبس؛ زەرب و چەنگ؛ دەردی گران ‹رنج زندگی: ژانی ژیان›.

▣ رنج بردن: ڕەنج کێشان؛ دەرد و مەینەت کێشان؛ کوێرەوەری دیتن؛ خەبسی بوون؛ چەوسانەوە؛ بە ژان دەربردن؛ بە کوێرەوەری سەر کردن؛ لە ڕەنجدا بوون ‹دو سال از بیماری رنج می‌بردم: دوو ساڵ لە نەخۆشی ڕەنجم دەکیشا›.

**رنج دادن**: ئازار دان؛ دەرد و مەینەت بەسەردا هێنان؛ ئازاراندن؛ ئازراندن؛ گەهراندن؛ چەوساندنەوە ‹بیماری قلب مرا رنج می‌داد: نەخۆشینی دڵ، ئازاری دەدام›.

**رنج دیدن**: ئازار دیتن؛ چەوسانەوە؛ مەینەت کێشان ‹در زندان رنج بسیار دید: لە بەندیخانەدا ئازاری زۆری دی›.

**رنج‌آور** / rancāvar/: *اسم.* ئازاردەر؛ قیچمە؛ هۆی بەدیهاتنی ڕەنج ‹این بیماری خیلی رنج‌آور است: ئەم نەخۆشیە یەکجار ئازاردەرە›.

**رنجاندن** / rancāndan/: *مصدر. متعدی.* // **رنجاندی**: ڕەنجاندت؛ **می‌رنجانی**: دەڕەنجێنی؛ **بِرنجان**: بڕەنجێنە// ١. ئازار دان؛ ڕەنجاندن؛ ئێشاندن؛ ئێشنەی؛ ئێشنای؛ ئێش پێ‌گەیاندن؛ ئاراندن؛ گەهراندن؛ ئازراندن؛ ڕەنجنەی ‹این آمپول برای رنجاندن تو نیست برای از بین بردن درد توست: ئەم دەرزیە بۆ ئازاردانی تۆ نیە، بۆ لابردنی ئێشی تۆیە› ٢. دڵ ئێشاندن؛ دڵ هێشت؛ ناڕەحەت کردن ‹قصد رنجاندن تو را نداشتم: بە نیازی دڵئێشاندنت نەبووم› * **رنجانیدن**

■ صفت فاعلی: **رنجاننده** (ڕەنجێنەر)/ مصدر منفی: **نَرنجاندن** (نەڕەنجاندن)

**رنجانیدن** / rancānîdan/ ☜ **رنجاندن**

**رنجبار** / rancbār/: *صفت.* مەینەتی؛ بە ڕەنج و ئاخ و داخەوە؛ پڕ لە دەرد؛ پڕ لە ژان ‹زندگی رنجبار: ژیانی مەینەتی›.

**رنجبر** / rancbar ، ـان/: *اسم.* ڕەنجبەر: ١. زەحمەتکێش؛ ئەرک‌گران؛ بارقورس؛ کەسێ کە لە دەسڕەنجی خۆی و بە زەحمەت و مەینەتەوە دەژی ٢. *[مجازی]* کارکەر؛ کاریەر؛ کرێکار.

▣ **رنجبر کشاورز**: سەپان؛ پالە؛ ڕەنجبەری پێنج‌یەک بەر، یان سێ‌یەک بەری داهات.

**رنجر** / rencer ، ـها/: [عربی] *اسم. [نامتداول]* ڕنجر: ١. نەواوانی چەکداری ناوچەیەک ٢. چریک؛ پێشمەرگە.

**رنجش** / ranceš ، ـها/: *اسم.* دڵئێشاوی؛ نقاری؛ قاری؛ ئازراوی؛ خێز؛ ملوولەی (بەتایبەت لەبەر ئاکاری کەسانی‌تر)؛ زیزی ‹موجب رنجش همکارانش شد: بووە هۆی دڵئێشاوی هاوکارەکانی›.

**رنجور** / rancûr/: *صفت. [ادبی]* دەردەدار: ١. ئێشدار؛ بەژان؛ چڵدار ‹پای رنجور؛ عضو رنجور: پای ئێشدار؛ ئەندامی بەژان› ٢. /ـان/ نەخۆش؛ نەوەش؛ ناساغ؛ بیمار ‹پدرش پیر و رنجور است: باوکی پیر و دەردەدارە›.

**رنجه** / rance/: *صفت. [ادبی]* ماندوو؛ کز؛ پەک‌کەوتە ‹مکن رنجه تیغ زبان را بە لاف: نەکەی ماندوو زمانت بۆ قسەی پووچ›. هەروەها: **رنجه شدن؛ رنجه کردن**

**رنجیدگی** / rancîdegî ، ــها/:/سم. دڵماوی؛ دڵشکاوی؛ ڕەنجیاگی.

**رنجیدن** / rancîdan/: مصدر. لازم. // **رنجیدی:** ڕەنجای؛ **می‌رنجی:** دەڕەنجی؛ **برنج:** بڕەنجە// ڕەنجان؛ ڕەنجیان؛ دڵئێشان؛ دڵمان؛ دڵ شکیان؛ ڕەنجیەی.

■ صفت مفعولی: **رنجیده** (ڕەنجاو)/ مصدر منفی: **نَرنجیدن** (نەڕەنجان)

**رنجیده** / rancîde/: صفت. ڕەنجاو؛ ڕەنجیاگ؛ دڵداماو؛ خێز؛ سهـ ؛ دڵشکاو.

**رنجیده خاطر** / rancîdexāter/: [فارسی/ عربی] صفت. دڵئێشاو؛ دڵمەن؛ دڵگران ‹از حرف تو رنجیده‌خاطر شد: لە قسەکەی تۆ دڵی‌ئێشا›.

**رند** / rend ، ـها؛ ـان؛ رُنود/: صفت. ڕەند؛ وریا؛ زرت و زیندوو؛ سەگفزوول؛ زیرەک و شەیتان؛ پیتۆڵ بەتایبەت: *الف)* لە شاردنەوە و دەرنەخستنی تواناییگەل، بیر و هزر یان خواستەکانیدا ‹رند است، خودش را لو نمی‌دهد: ڕەندە، خۆی دەرناخا› *ب)* زۆڵ؛ لە کەڵک وەرگرتن و بە هەل زانینی کار و باران بە قازانجی خۆ ‹او رند است، سر همه‌تان کلاه می‌گذارد: زۆلە، کڵاو دەنێتە سەری هەمووتان›: **مردرند**

**رندانه**[1] / rendāne/: صفت. ڕەندانە؛ وەکوو ڕەندان ‹لبخند رندانه‌ای زد و هیچ نگفت: بزەیەکی ڕەندانەی کرد و هیچی نەگوت›.

**رندانه**[2]: قید. ڕەندانە؛ بە ڕەندیەوە ‹رندانە لبخند می‌زد و هیچ نمی‌گفت: ڕەندانە بزەی دەکرد و فزەی نەدەکرد›.

**رنده** / rande ، ـها/:/سم. ڕەنە؛ ڕەندە؛ ڕنە؛ ڕنە: ۱. ڕەندەش؛ کوشتەرە؛ کەشتەرا؛ ئامرازی نەجار بۆ لووس‌کردنی دار ۲. ڕەندەتی؛ ڕنکە؛ پەڕەیەکی کون‌ـ‌کونە بۆ وردکردنی بڕێ خواردەمەنی تورت (وەک: پیواز، سێفەزەمینە و...).

▣ **رنده کردن:** ڕەنەکردن؛ ڕەندەکردن: ۱. تاشین و لووس کردنی چێو بە ڕەنە ۲. لە ڕەنە دان؛ ورد کردنی شتێ بەتایبەت ماکی خواردەمەنی بە ڕەنە.

**رندی** / rendî/:/سم. ڕەندی: ۱. وریایی؛ بار یان چۆناوچۆنی ڕەند بوون ‹با ... خودش را خلاص کرد: بە وریایی خۆی ڕزگار کرد› ۲. شەیتانی؛ سەگفزوولی؛ پێچ و پەنایی؛ زۆڵی ‹می‌خواست رندی کند و سرم را شیره بمالد: دەیەویست سەبیلی بکا و کڵاوم لە سەر بنێ›.

**رندیدن** / randîdan/: مصدر. متعدی. // **رندیدی:** ڕەنەت‌کرد؛ **می‌رندی:** ڕەنە دەکەی؛ **برند:** ڕەنە بکە// ڕەنەکردن؛ ڕەندەکردن؛ ڕەنەدان: ۱. ڕێک کردن یان تاشین و ناسک‌کردنەوەی ڕووی شتێک (بەتایبەت لەمەڕ چێوەوە) ۲. *[قدیمی]* ڕنین؛ ڕنەی؛ کڕاندن؛ ڕووش تێخستن ۳. *[قدیمی]* کڕاندن؛ هەڵکڕاندن؛ جیا کردنەوە.

■ صفت مفعولی: **رندیده** (ڕەندەکراو)

**رنسانس** / ronesāns/: [فرانسوی]/سم. ۱. ڕەوتی نوێبوونەوە؛ لە نۆ سەرهەڵدانەوە ۲. دەورانی سەرهەڵدانەوە و ژووژانەوە لە باری وێژە و زانست و هونەر و پیشەسازی لە مێژووی ئوروپادا (لە نێوان چەرخی ۱٤ تا ۱٦ی زایینی).

**رنگ** / rang/:/سم. ۱. ڕەنگ؛ چڕ؛ بێز؛ دیاردەی نووری یا پێزانینی چاوی کە دەبێتە هۆی ئەوەی شتان لێک جیا بکرێنەوە ‹در تاریکی که رنگ چیزی معلوم نیست: لە تاریکیدا خۆ ڕەنگی هیچ شتێ دیار نیە› ۲. /ـها/ ڕەنگ؛ چڕ؛ بێز؛ هەر یەک لە تایبەتمەندیگەلی هەر شتێک کە بە چاو هەستی پێ دەکرێ ‹رنگ سفید؛ رنگ آبی: ڕەنگی سپی؛ ڕەنگی ئاوی› ۳. /ـها/ ڕەنگ؛ چڕ؛ بێز؛ ماک یان پێکهاتەیێ کە ڕەنگ دەدا بە شت ‹برو یک قوطی رنگ بخر!: بچۆ قوتوویێک ڕەنگ بسێنە!› ٤. *[مجازی]* فێڵە؛ فێڵ ‹می‌خواست مرا رنگ کند: دەیەویست فێل لە من بکا› ٥. *[مجازی]* بۆ؛ تام؛ نیشانە و شوێنەواری دۆخ یان حالەتێک

‹حرفهایش رنگ تعصب داشت: قسەکانی بۆی ڕکەی لێوە دەهات›.

◘ **رنگ اصلی**: ڕەنگی سەرەکی؛ سێ ڕەنگی سوور و کەسک (سەوز) و شین (ئاوی) کە لە تێکەڵیان، هەموو ڕەنگەکانیتر درووست دەبن.

**رنگ روغن/ روغنی**: ڕەنگی نەوتی؛ ڕەنگی بە ماکێ چەورەوە کە دوای ئەوە وشک بێتەوە، وەکوو پەڕەیەکی ڕەنگی لێ دێ و ئاو نایبا.

**رنگ سرد**: ڕەنگی سارد؛ هەموو ڕەنگەکانی نێوان کەسک و بەنەوش.

**رنگ گرم**: ڕەنگی گەرم؛ هەموو ڕەنگەکانی نێوان زەرد و ئەرخەوانی.

◘ **رنگ باختن**: ١. پرووسقان؛ ڕەنگ چوون؛ ڕەنگ لێ نەمان؛ کاڵ بوونەوە؛ شەمزان؛ کەمڕەنگ بوونەوە؛ ڕەنگی خۆ لە دەست دان ٢. ڕەنگ پەڕین؛ ڕەنگ پەڕیان؛ ڕەنگ پڕیەی؛ ڕەنگ بزرکان بە هۆی ترس یان نارەحەتیەوە ٣. *[کنایی]* بێقەدر بوون؛ قیمەت نەمان؛ سووک بوون؛ بێبڕ بوون؛ شکۆ و گرانایی خۆ لە دەس دان.

**رنگ به رنگ شدن**: ڕەنگ گۆڕان؛ ڕەنگ واریەی/ واریای: ١. بە ڕەنگیتر دەرهاتن ٢. کاڵەوە بوون؛ کاڵەوبوون؛ هەزار ڕەنگ گۆڕان؛ بەهۆی شەرمەزاریەوە سوور و زەرد هەڵگەڕان ‹نامه را که دید، رنگبەرنگ شد: هەر نامەکەی دی ڕەنگی گۆڕا›.

**رنگ پریدن**: ڕەنگ لێپەڕین؛ هەڵبزرکان؛ ڕەنگ بزرکان؛ ڕەنگ فڕین؛ نەمانی بریقە و درەوشانەوەی ڕەنگ.

**رنگ دادن**: ڕەنگ دانەوە؛ ڕەنگەوە دای ‹این پارچە رنگ میدهد: ئەم پارچەیە، ڕەنگ دەدانەوە›.

**رنگ زدن**: ١. ڕەنگکردن؛ گۆناندن؛ ڕەنگاندن ‹رنگ زدن در: ڕەنگ کردنی دەرگا› ٢. *[مجازی]* کلاو لە سەر نان؛ فریو دان * **رنگ کردن**

**رنگ عوض کردن**: ١. ڕەنگ گۆڕین ‹برگهایش کم‌کم رنگ عوض کرد: گەڵاکانی بەرە ـ بەرە، ڕەنگیان گۆڕی› ٢. *[کنایی]* خۆ گۆڕین؛ وێ وارەی؛ پۆس وەتەی؛ شێوە و ڕێبازی ئاکار و کرداری خۆ گۆڕین و بە جۆرێکیتر خۆ نیشاندان ‹تا ورق برگشت، او هم رنگ عوض کرد و شد مسلمان دوآتشه: کە دەوران گۆڕا، ئەویش خۆی گۆری و بوو بە موسوڵمانێکی توند و تیژ›.

**رنگ کردن** ☜ **رنگ زدن**

**رنگ گرفتن**: ڕەنگی بوون.

**رنگ نداشتن**: بێڕەنگ یان کەمڕەنگ بوون؛ ڕەنگ لێ نەبوون ‹این چایی رنگ ندارد: ئەم چاییە کەمڕەنگە›.

**رنگ** / reng ، ـ ها/: *اسم.* بەزمی مووسیقایی؛ شێوازێکی کرژ لە مووسیقادا کە زۆر کات لە کۆتایی ئاهەنگێکدا بە ڕێوەی دەبەن.

**رنگ‌آمیزی** / rang'āmîzî, rangāmîzî ، ـ ها/: *اسم.* ڕەنگ؛ ڕەنگکاری؛ کفتکاری؛ کار یان ڕەوتی ڕەنگاندن؛ ڕەنگ هەڵسوون دەشتێکدا ‹نقاشی را با مداد رنگی رنگ‌آمیزی کرد: نەقاشیەکەی بە قەڵەمڕەنگی ڕەنگ کرد›.

**رنگار** / rangār/: *اسم.* حەوڕەنگیلە؛ سەمای ڕەنگەڵ (وەک ڕەنگیلەی بلقی سابوون).

**رنگارنگ** / rangārang/: *صفت.* ١. ڕەنگامە؛ ڕەنگاوڕەنگ؛ ئالایی؛ گوڵگوڵی؛ بەڵەک بردێنی ٢. *[تعریض]* جۆراوجۆر؛ جۆرواجۆر؛ جۆربەجۆر ‹آدمهای رنگارنگی به آن خانه رفت و آمد داشتند: کەسانێکی جوراوجور هاتوچووی ئەوماڵەیان دەکرد› * **رنگ و وارنگ**

**رنگباختگی** / rangbāxtegî/: *اسم.* هەڵبزرکاوی؛ ڕەنگبزرکاوی؛ چۆناوچۆنی لەدەسدانی ڕەنگی ئاسایی.

**رنگباخته** / rangbāxte/: *صفت.* کاڵ: ١. ڕەنگ بزرکاو؛ هاڵ؛ کاڵەوەبووگ؛ ڕەنگ نەماو؛

بێبەشکراو لە ڕەنگی ئاسایی خۆ ‹چهرەی رنگباختە: ڕوومەتی ڕەنگبزرکاو› ۲. *[مجازی]* کەمڕەنگ؛ ڕزاو؛ کۆنە؛ ولانراو ‹این آبی خیلی رنگباختە است: ئەم شینە زۆر کاڵە›.

**رنگبری** / rangbarî/: *اسم.* کار یان ڕەوتی ڕەنگ لێهەڵگرتنەوە؛ ڕەنگ لێ سڕینەوە. هەروەها: **رنگبر**

**رنگ بندی** / rangbandî/: *اسم.* ڕەنگبەندی؛ چۆناوچۆنی وێککەوتن و جێگر بوونی ڕەنگ لە ئاسەوارێکدا (وەک وێنەکێشی، وێنەگری) یان لە کۆمەڵەیەکدا (وەک: جلوبەرگ و...).

**رنگ بەرنگ** / rangberang/: *صفت. [گفتاری]* ڕەنگامە؛ ڕەنگاوڕەنگ.

**رنگ پریدگی** / rangparîdegî/: *اسم.* ڕەنگپەریوی؛ ڕەنگپەڕایی؛ ژاکاوی؛ ڕەنگبزرکاوی؛ بار یان چۆنیەتی ڕەنگپەڕان.

**رنگ پریدە** / rangparîde/: *صفت.* ڕەنگپەریو: ۱. کاڵەوە بووگ؛ گەوزکەوتا ‹پارچەی رنگپریدە: پارچەی کاڵەوەبووگ› ۲. کاڵ؛ کەمڕەنگ ‹آبی رنگپریدە: شینی کاڵ› ۳. پەژمەریو؛ گەوزکەوتا ‹آفتاب رنگپریدە: تاوی ڕەنگپەریو› ٤. /ـها/ ڕەنگبزرکاو؛ سیس و ژاکاو؛ بە ڕەنگ پێستی تۆخ بەتایبەت لە بەر نەخۆشی یان ئاڵۆزی ‹صورت رنگپریدە: دیمەنی ژاکاو›.

**رنگتابی** / rangtābî/ ☜ **فامنمایی**

**رنگدانە** / rangdāne ، ـها/: *اسم.* ڕەنگدانە؛ ماکی هۆی ڕەنگی بوونی هەر شتێک، وەک کولورۆفیل لە گیادا و هیموگلۆبین لە خوێندا.

**رنگرز** / rangraz ، ـها؛ ـان/: *اسم.* خومچی؛ خومخانەچی؛ خمگەر؛ خومگەر؛ ڕەنگڕێژ؛ کەسێ کە کاری ڕەنگکردنی تاڵ و هەودا و چنراوەیە.

**رنگرزی** / rangrazî/: *اسم.* ۱. خومگەری؛ ڕەنگڕێژی ۲. خومخانە؛ دوکانی خومگەری ۳. پیشەی ڕەنگڕێژی.

**رنگروغن** / rangrowqan, -ro:qan/ ☜ **رنگ**

**رنگزا** / rangzā/: *صفت.* ڕەنگدەر؛ بە تایبەتمەندی یا توانستی بەدیهێنانی ڕەنگی دیار ‹مادەی رنگزا: ماکی ڕەنگدەر›.

**رنگزدا** / rangzodā/: *صفت.* ڕەنگلابەر؛ ڕەنگهەڵگر؛ بە تایبەتمەندی یا توانی لابردنی ڕەنگ ‹آب اکسیژنە، رنگزُداست: ئاوئوکسیژنە، ڕەنگلابەرە›.

**رنگزدایی** / rangzodāyî/: *اسم.* ڕەنگلابەری؛ ڕەنگهەڵگری: ۱. کار یان ڕەوتی ڕەنگ لێ کردنەوە؛ ڕەنگ هەڵگرتنەوە ۲. کار و ڕەوتی ڕەنگ لێ سڕینەوە.

**رنگسازی** / rangsāzî/: *اسم.* ڕەنگسازی: ۱. کار و ڕەوتی ڕەنگ چێکردن؛ ڕەنگ دروست کردن ۲. /ـها/ شوێنی ڕەنگ چێ کردن.

**رنگسنج** / rangsanc ، ـها/: *اسم.* ڕەنگپێو؛ کەرەسەیەک بۆ دیاری کردن و ناسینەوەی ڕەنگ.

**رنگسنجی** / rangsancî/: *اسم.* ڕەنگپێوی؛ زانست یان زانیاری ناسینەوە و دەستنیشان کردنی ڕەنگەکان.

**رنگشناسی** / rangšenāsî/: *اسم.* ڕەنگناسی؛ بەشێک لە زانستی ناسینی ڕەنگ کە لە زۆری و کەمی ڕەنگگەل دەکۆڵێتەوە.

**رنگکار** / rangkār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ڕەنگکار؛ نەقاش؛ کەسێ کە کاری ڕەنگ کردنە ‹رنگکار اتومبیل: ڕەنگکاری ماشین›. هەروەها: **رنگکاری**

**رنگنگاری** / rangnegārî/ ☜ **کروماتوگرافی**

**رنگورو** / rang-o-rû/: *اسم.* ڕەنگ و ڕوو: ۱. شکڵ و بیچم؛ مەعد؛ ڕەنگی ڕوو ‹با این رنگورو داد میزند غریبە است: بەم شکڵ و بیچمەوە زەق دیارە نامۆیە› ۲. ڕەنگی ڕواڵەتی هەر شتێک ‹آن میز قبلی دستکم رنگورویی داشت: مێزە پێشووەکە هیچ نەبێ ڕەنگ و ڕوویەکی هەبوو›.

**رنگورورفته** / rang-o-rûrafte/: *صفت.* ۱. هاڵ؛

کاڵەوبووگ؛ ڕەنگ‌نەماو؛ ڕەنگ‌پەڕیو ٢. *[مجازی]* کۆنە؛ کۆن؛ شڕ ‹قالی رنگ‌ورو رفته: قاڵی کۆن›.

**رنگ‌ووارنگ** / rang-o-vārang/: *صفت. [گفتاری]* ئاڵووالا؛ ڕەنگامە؛ هەمەڕەنگە.

**رنگی** / rangî/: *صفت.* ١. ڕەنگی؛ ڕەنگ وەخۆگرتوو ‹لباسم رنگی شد: گنجەکەم ڕەنگی بوو› ٢. *ـها/* ڕەنگامە؛ ڕەنگین؛ بەلەک بردێن ‹یک روسری رنگی سرش کرده بود: سەرپۆشێکی ڕەنگامەی دابوو بە سەریدا› ٣. *ـها/[چاپ]* بە ڕەنگی زیاد لە ڕەش و سپی ‹عکس رنگی: وێنەی ڕەنگی›.

**رنگیزه** / rangîze، ـها/: *اسم.* ڕەنگدانە؛ ماکی ڕەنگ؛ ماکی هۆی ڕەنگدار بوونی هەر شتێک، بەتایبەت گەردێک کە دەکرێتە نێو تراوێکەوە بۆ چێ‌کردنی ڕەنگ.

**رنگین** / rangîn/: *صفت. [ادبی]* ڕەنگین؛ ڕەنگی؛ ڕەنگامە.

**رنگین‌پوست** / rangînpûst، ـها؛ ـان/: *صفت.* ڕەنگین‌پێست؛ بە نەژادی جگە لە سپی (وەک ڕەش و سوور و زەرد).

**رنگین‌تن** / rangîntan، ـها/: *اسم.* کرۆمۆزۆم.

**رنگینک** / rangînak/: *اسم.* جۆرێ هەڵوا کە بە ئاردی سوورەوەکراو، وردەقەن، خورما، پستە و هەزوێلە چێ دەبێ.

**رنگین‌کره** / rangînkore/: [فارسی/ عربی] *اسم.* کرۆموسفیر؛ خوارووترین توێژی جەوی خۆر کە ئەستووری دەگاتە هەزاران کیلۆمیتر و زۆرتر لە گازی هیدرۆژن پێکهاتووە و تەنیا کاتێ دەبینرێ کە بینەر، دوای باران، پشت بە هەتاو چاو لە ئاسمانی بەرانبەری خۆی بکا. **کُرموسفر**

**رنگین‌کمان** / rangînkamān، ـها/: *اسم.* کۆڵکەزێڕینە؛ پەلکەزێڕینە؛ هەورەزێڕینە؛ هەسارەزەڕینە؛ هەسێرەزێڕینە؛ پەلکەڕەنگینە؛ زەڕینە و سیمینە؛ سوورەزەڕینە؛ ووشەزەڕینە؛ ئەستوونەزێڕینە؛ تکەسکەسوور؛ کەسکەسۆر؛ کەسکوسوور؛ هۆرەوری؛ پلووره وارانێ؛ کێلستوون؛ کێرستون؛ موندای ئاشمە؛ پەینجەو پەیغەمبەری؛ تیرەژە؛ زەرد و سویر؛ شەوبەندە ڕۆژ؛ توول سەوز و دێز؛ توول سەوز دێز؛ پرچی ئایشەوفاتمان؛ کەمەیەکی گەورەی ڕەنگاوڕەنگە، پاش باران و لە بەر هەتاوەوە لە ئاسمان دەردەکەوێ: **قوس قَزَح**

**رنود** / runûd, ronûd/: [فارسی بە قاعدەی عربی] *اسم.* ١. جمعِ ☜ **رند** ٢. خەڵکانی ڕەند.

**رنیم** / ren(i)yom/: *اسم.* ڕنیوم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی کەم بەدی، بە ژمارەی ئەتومی ٧٥ و کێشی ئەتومی ١٨٦،٢، بە ڕەنگی خۆڵەمێشی زێوی، کە بە شێوەی گەرد یان کانزای سەخت بە دەست دێ و لە پیشەسازیدا بەکاردەڕوا.

**ـ رو** / row, ro:/ *پیوازه.* ـ ڕەو؛ ـ ڕۆ: ١. بڕۆ؛ ڕەوەک ‹پیشرو: پێشرەو› ٢. لەبار بۆ ڕۆیشتن ‹پیادەرو؛ ماشین‌رو: پیادەڕەو؛ ماشین‌ڕۆ›.

**رو**[1] / rû/: *اسم.* ١. ڕوو؛ ڕوە؛ ڕوی؛ ڕوخسار؛ دەموچاو؛ دیمەن؛ سیما؛ ڕوومەت؛ چار ‹رویش را سفت گرفته بود: ڕووی سفت گرتبوو› ٢. سەر؛ بان؛ سەروو؛ سەروان؛ گژ. بەرانبەر: **زیر** ‹روی همه: سەری هەمووانەوە› ٣. ڕووبەڕوو؛ بەرامبەر؛ ئەو لایەی کە بەرەو بێژەر، بژنەو یان چەمکی وتووێژە. بەرانبەر: **پشت** ٤. بەشی بەرەو دەرەوە؛ ئەو لایەی کە بەرەو دەرەوەیە ‹روی پارچه: ڕووی پارچە› ٥. سەر؛ ڕوو ‹روی سفره: سەر سفره› ٦. *[مجازی]* ڕوو؛ ڕوە؛ ڕوی؛ بێ‌شەرمی؛ بێ‌حەیایی؛ بێ‌ئابڕوویی؛ ئەوەی بەر بە شەرم بگرێ ‹پُررو: ڕوودار›.

◙ **رو به موت**: کاتی ئاویلکە؛ لەسەرە مەرگدا؛ لە گیانەڵاو. هەروەها: **رو به خرابی؛ رو به آبادی؛ رو به ترقی**

**روی باز**: ڕووی گەش؛ دیمەنی ڕوون؛ ناوچاوی ڕۆشن؛ دەموچاوێ کە خۆشحاڵی یان میهرەوانی دەنوێنێ ‹با روی باز مرا پذیرفت:

بە ڕووی گەشەوە خێراتنمی کرد›.
**روی جلد:** ڕووپەڕی کتێب؛ سەربەرگ؛ بان جەڵد؛ ئەو بەشە لە کتێب کە پتر ناوەکەی بە سەرەوەیە (لە کتێبی کوردی و فارسی و عەرەبیدا لای ڕاست و لە کتێبی لاتینیدا لای چەپ).
**روی سخن:** دەمی قسە؛ لایەنی وتوویژ ‹روی سخنم با شماست: دەمی قسەم لە ئێوەیە›.
**به روی چشم:** سەرچاوان؛ بەسەرچاو؛ بان‌چاو؛ سەرووچەما؛ وەبان‌چاو/ چەو؛ سەر هەردووچاو؛ بە چاوان؛ وەبانی دیدە.
▣ **رو آمدن:** هاتنەبان؛ هاتنە سەرەوە؛ هاتنە سەر؛ هەلاتن: ١. هاتنەوە سەر؛ لە بنەوە بەرەو سەر هاتن ‹آمد روی آب: هاتەوە سەر ئاو› ٢. *[مجازی]* سەرکەوتن ‹خوب روآمده‌ای: چاک هاتیە سەر›.
**رو آوردن:** هانا بردن؛ ڕوو هێنان؛ بەرەو لای کەسێ یان شتێ (زۆرتر بە هیوای یارمەتی) چوون ‹برای کمک، به شما رو آوردم: بۆ یارمەتی، هانام بردە ئێوە›.
**رو انداختن:** ڕوو خستن ‹برای تأمین آن پول، به همه رو انداخت: بۆ دابین‌کردنی ئەو پارەیە ڕووی لە هەموو کەسێک خست›.
**رو برگرداندن:** *[کنایی]* ڕوو هەڵچەرخاندن؛ ڕوو وەرگەڕاندن؛ ڕوە وەگێڵنەی؛ دووری لێ گرتن ‹وقتی زنش را طلاق داد، همه از او رو برگرداندند: کە ژنەکەی تەلاق دا، هەموو ڕوویان لێ هەڵچەرخاند›.
**رو به قبله دراز شدن:** *[کنایی]* ڕوو کردنە ڕەشەبا؛ لنگ جووت کردن؛ کەوتنە سەرەمەرگ؛ ڕوو نیانە گیانەلاو؛ لە کاتی مەرگدا بوون.
**رو پنهان کردن:** خۆ شاردنەوە؛ خۆ حەشاردان؛ ڕوو نیشان نەدان ‹این روزها از من رو پنهان می‌کند: لەم ڕۆژانەدا خۆی لێم دەشارێتەوە›.
**رو ترش کردن:** *[مجازی]* ناوچاو تاڵ کردن؛ ناوچاو دانەیەکا؛ ڕوو گرژکردن؛ ڕوە ترشنەی؛ وەڕەزی و بێزاری خۆ پیشان‌دان.
**رو دادن:** *[مجازی]* ڕوو پێدان؛ ڕوودار کردن؛ گوساخ کردنی کەسێک بە هۆی میهرەوانی کردن لەگەڵیدا ‹به این شاگردت رو نده! ظرفیت ندارد: بەم بەردەستەت ڕوو مەدە! هەڵیناگرێ›.
**رو دادن و آستر خواستن:** *[کنایی]* ڕوو پێدان و پا بە سەردا نان/ پای زیادی داکێشان؛ لە بەخشین، یارمەتی یان میهرەوانی کەسێک کەوتنە ئازەوە و چاوەڕوانی زۆرتر هەبوون ‹به او رو بدهی استر هم می‌خواهد: ڕووی پێ بدەی، پات بە سەردا دەنێ›.
**رو داشتن:** *[مجازی]* ڕوودار بوون؛ بێشەرم بوون؛ بێ‌حەیا بوون.
**رو درماندن:** لە ڕوو هەڵنەهاتن؛ شەرم کردن؛ لە ڕوودا مانەوە؛ لە شەرمدا وەرامی ئەرێ دانەوە.
**رو شدن:** ١. دەرکەفتن؛ دەرکەوتن؛ کەوتەی سارا ٢. ڕوو بوون؛ لە ڕوو هەڵهاتن؛ شەرم نەکردن؛ خەجاڵەت نەکێشان؛ ڕوە بیەی ‹رویت می‌شود او را دست خالی برگردانی؟: ڕووت هەیە بە دەستی خالی بیگەڕێنیتەوە؟›.
**رو کردن:** ١. دەرخستن؛ خویا کرن؛ نیشان دان ‹هرچه داری روکن!: هەر چێکت هەیە، دەریخە› ٢. ڕوو کردن؛ ڕوە کەردەی؛ بەرەو کەسێک یان شتێک ڕوانین؛ چاو لێ کردن؛ لێ ڕوانین ‹رو کرد به من و جواب داد: ڕووی لە من کرد و جوابی دایەوە›.
**رو گرداندن:** ڕوو وەرگەڕاندن؛ چاوپۆشی کردن؛ چاو پۆشین لە ئەنجامدانی کارێک و نەکردنی ئەو کارە ‹از قبول ریاست رو کرداند: لە پەزیرانی سەرۆکایەتی ڕووی وەرگەڕاند›.
**رو گرفتن:** ڕووکردن؛ ڕوەکەردەی؛ شەرمە کردن؛ دیمەن پۆشین؛ دەم و چاوی خۆ داپۆشان ‹از آنهاست که از خروس هم رو می‌گیرد:

لەوانەیە کە لە کەڵەبابیش رووی دەدا›.

رو نشان ندادن: خۆ نەدانە نیشان؛ خۆ نیشان نەدان؛ خۆ دەرنەخستن؛ خۆ شاردنەوە؛ وێ سەخت کەردەی؛ دەرنەکەوتن ‹رفتم در خانەاش، رو نشان نداد: چوومە دەرکی ماڵی، خۆی نیشان نەدا›.

روی چیزی را پوشاندن: تەڤزاندن؛ سەر شتێک داپۆشان؛ بان شتێ دان؛ رووی شتێک داپۆشین؛ سەر شتێک نانەوە؛ رەو چێویوی ئەرەپۆژنەی.

روی خوش نشان ندادن: *[مجازی]* نەپەژیران؛ ڕێک‌نەهاتن؛ هاوڕێی نەکردن؛ هەڤ نەهاتن؛ خوزیان ‹بە پیشنهادم روی خوش نشان نداد: پێشنیارەکەمی نەپەزیرا›.

روی کاری را نداشتن: لە ڕوو هەڵنەهاتن؛ شەرم کردن و خەجاڵەت کێشان بۆ کردنی کارێک ‹روی برگشتن به خانه را هم نداشت: لە رووی هەڵنەدەهات بێتەوە ماڵیش›.

روی کسی/ چیزی را سفید کردن: *[مجازی]*
١. بوونە هۆی ڕووسووری و سەربەرزی
٢. *[تعریض]* لە کەسێ/ شتێ بردنەوە؛ لە خراپەدا پێشکەوتن ‹او در بی‌رحمی روی چنگیز را سفید کرده بود: لە دڵڕەقیدا لە جەنگیزی بردبوو›.

روی کسی را به زمین انداختن: *[مجازی]* ڕووی کەسێ دانە زەویدا؛ داخوازی کەسێک بەجێ‌نەهێنان ‹باور نمی‌کردم روی پدرت را زمین بندازی: باوەڕەم نەدەکرد رەنگی باوکت بدەیتە زەوید›.

روی کسی را کم کردن: *[مجازی]* دەندووک کەسێک شکاندن؛ دەنووک کەسێ قرتانن/ کردن؛ ڕووی کەسێک کەم کردن؛ پێش لە بێ‌شەرمی کەسێ گرتن.

روی کسی زیاد شدن: ڕوودار بوونی کەسێک؛ ڕووی کەسێک زۆر بوون.

از رو بردن: ڕوو شکاندن؛ لە ڕوو بردن؛ سەر پێ داخستن؛ سەر لەبەر کردن؛ شاقەڵ شکاندن؛ شاخی کەسێک شکاندن ‹این قدر اصرار کرد کە مرا از رو برد: هێندە پێ‌داگرت، ڕووومی شکاند›.

از رو خواندن: خوێندنەوە؛ لە ڕوو خوەندنەوە؛ ڕەوەوە وەنەی ‹شعر عقاب را برایش از رو خواندم، گفت باید از بَر کنی: شیعری هەڵۆم بۆ خوێندەوە، گوتی دەبێ لەبەری کەی›. هەروەها: **از رو نوشتن**

از رو نرفتن: *[مجازی]* لە ڕوو نەچوون؛ پاشگەز نەکردنەوە؛ پێ‌چەقێنی کردن لە بەرامبەر بەرپەرچ دانەوەدا.

آن روی کسی بالا آمدن: *[مجازی]* تووڕە بوون؛ ڕق هەستان؛ خەزرین؛ ئاردەیوە مەلێ ‹مگذار آن روی من بالا بیاید: مەهێڵە تووڕە ببم›.

به رو افتادن: بە دەمەوە کەوتن؛ دەمەوڕوو کەفتن؛ لەپەوڕوو کەوتن؛ دەمەوخوار کەوتن؛ دەمەوڕوو کەفتن؛ ڕوەرە کەوتەی؛ کەوتنە زەویدا بە شێوەیەک کە پشت بەرەو ئاسمان بێ.

به روی خود نیاوردن: *[مجازی]* خۆ لێ گێل کردن؛ خۆ کردنە تووڵبڕ؛ خۆ کردنە گووکەر؛ بە ڕووی خۆدا نەهێنان؛ خۆ نائاگا و نائاشنا نیشان‌دان ‹چند بار صدایم کرد، ولی به روی خودم نیاوردم: چەن جار قاوی لێکردم، بەڵام خۆم لێ گێل کردم›.

بە روی کسی نیاوردن: *[مجازی]* بە ڕووی کەسێکدا نەدانەوە؛ لەمەڕ باس و بابەتێک (کە پێوەندی بەو کەسەیە و ئەو لێی ئاگادارە) لە گەڵیدا نەدوان ‹هیچ به رویش نیاوردم کە قبلاً می‌دانستم: هەر نەمدا بە ڕوویدا کە زووتر دەمزانی›.

تو(ی) روی کسی ایستادن: لە بەرامبەر کەسێکەوە وەستان؛ بەرەنگار بوونەوە و ڕێک

**نەهاتن لەگەڵ کەسێکدا** ‹**تو نباید** تو روی پدرت **بایستی و با او یکی‌بەدو کنی: ئەتۆ نابێ** لە بەرامبەر باوکتەوە بوەستی **و چەقە و هەرای لەگەڵدا بکەی**›.

**تو روی کسی گفتن**: نیانە ڕووی کەسێکەوە؛ (لە)ڕووبەڕووی کەسێکدا وتن.

**رو**²: *قید.* ١. بان؛ سەر؛ لە بان شتێکەوە ‹بر روی **میز: لە** بان **مێزەوە**› ٢. سەر؛ ڕوو؛ ڕوە؛ قەی؛ بە ڕووی شتێکەوە ‹روی **دیوار نوشتە بودند**: لە سەر **دیوارەکەدا نووسیبوویان**› ٣. لەبان؛ لەسەر؛ لەمەڕ کەسێ یان شتێکەوە ‹روی **آن زمین خیلی کار کردەاند**: لە بان **ئەو زەمینەوە زۆریان کار کردووە**›.

▣ **روی هم**: سەرجەم؛ لەبان یەک؛ لەسەریەک؛ پێکەوە؛ بەیەکەوە؛ یەکجێ؛ پێوەرە؛ یۆوە ‹روی‌هم **می‌شود صد تومان**: سەرجەم **دەبێتە سەد تمەن**›.

▣ **روی آب افتادن**: *[کنایی]* کەوتنە سەر ئاو؛ عالەم پێزانین؛ دەرکەوتن ‹**حقەاش** روی آب افتاد **و همە فهمیدند: فێڵەکەی** کەوتە سەر ئاو **و هەمووان پێیان زانی**›.

**روی آب نشستن**: *[کنایی]* بەسەر ئاوەوە بوون؛ ئاو بردن؛ لە بارێکی نالەبار و نامەندا بوون.

**روی پا بند نبودن**: *[کنایی]* سەقام نەگرتن؛ ئارام نەگرتن (بەتایبەت لە خۆشیاندا)؛ لە جموجووڵدا بوون ‹**از خوشحالی** روی پایش بند نمی‌شد: **لە خوەشیدا** سەقامی نەدەگرت›.

**روی پای خود ایستادن**: *[کنایی]* خۆ بە ڕێوە بردن؛ خۆ بەخێو کردن؛ لە سەر پێی خۆوە وەستان ‹**با وجود این‌همە مشکلات، او توانستە است** روی پای خودش بایستد: **بەم هەموو گیر و گرفتەوە، توانیویە** خۆی بە ڕێوە ببا›.

**روی چیزی کشیدن**: کێشانە سەر شتێکدا؛ لێ زیاد کردن ‹**هر سال دە هزار تومان** می‌کشد روی اجارەنامە: **هەموو ساڵێ دە هەزار تمەن** دەکێشێتە سەر **کرێ‌ماڵەکەدا**›.

**روی حرف کسی حرف زدن**: لە بەرامبەر قسەی کەسێکەوە وەستان ‹**نباید** روی حرف مادرت حرف بزنی: **نابێ** لە بەرامبەر قسەی دایکتەوە بوەستی›.

**روی خود/ کسی کشیدن**: بەسەر خۆ/ کەسێکدا دان/کێشان؛ خۆ/ کەسێ داپۆشین ‹**پتو را** روی بچە بکش، **هوا سرد است: پەتووەکە** بدە سەر منداڵەکەدا، **هەوا ساردە**›.

**روی دایرە ریختن**: ئاشکرا کردن؛ دەرخستن ‹**هرچە داری** بریز روی دایرە!: **ئەوەی پێتە،** ئاشکرای کە!›.

**روی دست بردن**: *[کنایی]* بە سەر دەستەوە بردن؛ ڕاوە بەردەی؛ زەوی نەگرتن؛ زۆر بەبرەو بوون: **سردست بردن**

**روی دست کسی بلند شدن**: دەرقەوی کەسێ هاتن؛ لە بەرامبەر کەسێکەوە ڕاستەوە بوون ‹**در زور بازو**، روی دست همە بلند شدە: **لە هێزی باسکدا** دەرەقەوی هەموو هاتووە›.

**روی دست کسی ماندن**: *[کنایی]* مانەوە؛ زەوی گرتن؛ لە برەو کەوتن ‹**هرچە برای فروش آوردە،** ماندە روی دستش: **ئەوی بۆ فرۆتن هێناویە،** ماوەتەوە›.

**روی دست و پای کسی افتادن**: کەوتنە مل دەست و پای کەسێکدا؛ لاڵانەوە و پاڕانەوە لە کەسێک؛ لە بەرانبەر کەسێکدا بەندەیی و خاکەساری پیشان دان ‹افتادە بود روی دست و پای **قاضی و التماس می‌کرد**: کەوتبووە مل دەست و پای دادوەردا **و دەپاڕایەوە**›.

**روی دندەی چیزی افتادن**: *[مجازی]* کەوتنە سەر باری شتێک؛ لە ڕەفتاری خۆدا شتێک نیشان دان ‹**وقتی** روی دندەی لج بیفتد، **بە هیچ صراطی مستقیم نیست؛ وقتی** روی دندەی جوانمردی بیفتد، **سرش مال خودش نیست؛ آن روز آزاد** روی دندەی چپ افتادە بود **و با همە دعوا داشت: کاتێ** بکەویتە سەر باری ڕکدا، **خودای خۆی بە حەق**

ناناسیێ؛ کاتێ بکەویتە سەرباری جوامیریدا، سەریشی دادەنێ؛ ئەو ڕۆژە ئازاد کەوتبووە سەر باری خراب و لەگەڵ هەموو کەسێکدا شەڕی دەهات›.

**روی زمین سفت نشاشیدن:** *[مجازی، عامیانە]* تووشی سەختی و سەخڵەت نەهاتن؛ سەختی نەدیتن ‹تو هنوز روی زمین سفت نشاشیدەای تا بفهمی: تۆ هێشتا تووشی سەختی و سەخڵەت نەهاتووی تا بزانی›.

**روی سر/ چشم خود جا دادن:** *[مجازی]* لەسەر سەر/ چاوی خۆ نان؛ زۆر ڕێزگرتن و خۆش ویستن.

**روی سر کسی خراب شدن** ☜ سر کسی خراب شدن، سر[3]

**روی سر گذاشتن:** *[مجازی]* ١. لەسەر سەر/ چاو دانان؛ زۆر ڕێز گرتن ‹من آن را روی سرم می‌گذارم: ئەمن ئەوە لەسەر سەر/ چاوی دادەنێم› ٢. گرتنە کۆڵەوە؛ نانە بان سەرەوە؛ زۆر شلۆغ کردن و تێکدانی شوێنێک ‹خانە را روی سرش گذاشتە بود: ماڵەکەی گرتبووە کوڵەوە›.

**روی شاخش بودن:** *[مجازی]* پێوە بوون؛ مسۆگەر بوون؛ بێشک وەها بوون ‹سە سال زندان روی شاخش است: سێ‌ساڵ زیندانی پیوەیە›.

**روی غلتک افتادن:** *[کنایی]* کەوتنە ڕێ؛ کەوتەی ڕا؛ ڕێ‌کەوتن؛ داهاتن؛ جێ‌بەجێ بوون ‹کارها کە روی غلتک افتاد، من می‌روم: هەر کارەکان کەوتنە ڕێ، من دەڕۆم›.

**روی کسی/ چیزی حساب کردن:** *[مجازی]* بە هیوای کەسێ/ شتێک بوون؛ دڵ بە کەسێ/ شتێک خۆش کردن ‹خیلی روی تو حساب می‌کردم: زۆر بە هیوای تۆ بووم›.

**روی کسی/ چیزی سرمایەگذاری کردن:** بە ئومێدی قازانج، پووڵ و پارەیەک بۆ کەسێ یان شتێ خەرج کردن.

**روی هم ریختن:** ١. خستنە سەر یەک؛ کۆ کردنەوە لە شوێنێکدا ‹پولهایشان را روی هم ریختند، شد سیصد تومان: پووڵەکانیان خستە سەر یەک، بوو بە سێسەد تمەن› ٢. کەوتنەیەک؛ پێکەوە سازیان و ئاریکاری کردن؛ لەڤ هاتن؛ یەک گرتن ‹روی هم ریختە بودند، اتومبیل آزاد را بدزدند: کەوتبوونە یەک، ماشینەکەی ئازاد بدزن› ٣. *[مجازی]* کەین‌وبەین خۆش کردن؛ دامەزراندن؛ پێکەوەنان ‹با زن همسایە روی هم ریختە بود: لەگەڵ ژنە هاوسێکەدا کەین‌وبەینیان خۆش کردبوو›.

**روی هم گذاشتن:** ١. لەسەریەک نان؛ نانە سەر یەک؛ یۆوە نیای ‹دوتا چهارپایە روی هم گذاشت و رفت بالا: دوو دانە چوارپایەی لەسەر یەک نا و چووە سەر› ٢. لە شوێنێک‌کۆکردنەوە ‹پولهایمان را روی هم گذاشتیم و یک رادیو خریدیم: پارەکانمان نایە سەر یەک و ڕادیۆیێکمان کڕی›.

**رو –[3]:** *پیشواژە.* روو –: ١. رووکێش؛ پۆشش ‹روانداز: رووخەر› ٢. دۆخ یان چۆنیەتی لە بان شتێکەوە بوون ‹روکار: رووکار›.

**– رو[4]:** *پیواژە.* ١. – ڕسک؛ – ڕست؛ – ڕۆ؛ بە ڕوانەوە ‹خودرو: خۆڕسک› ٢. – روو؛ – ڕوە؛ خاوەن تایبەتیەک لە ڕوومەتدا ‹خوشرو: خۆشروو›.

**روا** /ravā/: *صفت.* ڕەوا: ١. بەجێ؛ لەجێ؛ حلێو؛ حلێب؛ هەلێب ‹روا شمردن: ڕەوا زانین› ٢. وەرگیراو؛ پەژیراو؛ پەسندکراو؛ بەدیهاتوو؛ قەبووڵکراو؛ جێبەجێ کراو؛ بەگا ئاما ‹حاجتش روا شد: نیازەکەی وەرگیرا› ٣. ڕجوا؛ شیاو؛ گونجاو لەگەڵ قانوون و دابونەریتدا ‹عمل روا: کاری ڕەوا›. بەرانبەر: **ناروا**

◘ **روا بودن:** باش بوون؛ پەسند بوون ‹روا نیست مادرت را بیازاری: باش نیە دایکت ئازار بدەی›.

**روا داشتن:** وەرگرتن؛ بە شیاوی وەرگیران زانین ‹آیا قانون چنین کاری را روا می‌دارد؟: ئایا

قانوون ئاوا کاریّ وردەگری؟›.

**روا دانستن/ دیدن** ☜ **روا شمردن**

**روا شدن:** بەڕێوە چوون؛ کودان؛ قەدان؛ مەشان؛ جێبەجیّ بوون.

**روا شمردن:** ڕجوا دین؛ ڕەوا دیتن؛ پەزیران؛ پەژێران؛ پیّ قایل‌بوون؛ هەڵگرتن؛ قیم پیّ ئانین؛ دڵ پیّ ڕازی بوون: **روا دانستن/ دیدن**

**روائی** / ravā'î/ ☜ **روایی**

**روابط** / ravābet/: [عربی] جمعِ ☜ **رابطه**

▣ **روابط عمومی** ☜ **روابط‌عمومی**

**روابط‌عمومی** / ravābet(e)'umûmî, -'omûmî/: [عربی]/اسم. (دایرەی) پێوەندیەگشتیەکان: ١. کار و ڕەوتی ناساندن و هۆگرکردنی خەڵک بەرابەر بە کەسیّ یان دامەزراوەیەک ٢. مەزرینگە یان تاقمێک کە ئەو کارەیان بە ئەستۆیە.

**رواج** / ravāc/: [عربی]/اسم. باو؛ برەو؛ ڕەواج: ١. مۆرە؛ ڕمێن؛ گەڕ؛ ڕەونەق؛ گەردان؛ کار یا ڕەوتی کەڵک وەرگرتنی گشتی یان گەلەک زیدە ‹اینجا قهوه چندان رواج ندارد: لێرەدا قاوە زۆر باو نیە› ٢. گەشە؛ پێشڕەوت ‹در اینجا خانه‌سازی رواج زیادی دارد: لێرەدا ماڵ کردنەوە گەشەیێکی زۆری هەیە›. هەروەها: **رواج دادن؛ رواج داشتن؛ رواج یافتن**

▣ **رواج یافتن:** پەرە گرتن؛ پەرە ساندن؛ کەوتنە گەڕ؛ هاتنە ڕمێن؛ برەو پەیدا کردن.

**رواداری** / ravādārî/: اسم. ١. کار یان ڕەوتی هەڵکردن لەگەڵ بیر و بڕوا یان دینگەلی دیکەدا ٢. کار یان ڕەوتی بە ڕەوا زانین؛ ڕجوا دیتن.

**روادید** / ravādîd/: اسم. ویزا؛ بەرایی چوونە وڵاتێک کە لە لایەن نوێنەری ئەو وڵاتە، بە بیانیان دەدریّ.

**رواق** / ravāq، ـها/: [عربی]/اسم. بەرهێوان؛ وەرهەیوانە؛ باڵەخانە؛ بالاخانە؛ بەرمەیتاوی پێشەوەی ماڵ کە زۆرتر سەرگیراوە.

**رواقی** / ravāqî/: [عربی]/اسم. ڕەواقی: ١. ڕێبازی فەلسەفی یوونانی باستان کە دەیگوت، مرۆڤی ژیر دەبیّ لە هەوا و هۆک دووری بکا و تووشیاری ڕک و خۆشی نەبیّ و مل بدا بە عیشقی خۆڕسک ٢. /ـها؛ ـان؛ ـون/ هەر کام لە پەیڕەوانی ئەو ڕێبازە.

**روال** / revāl, ravāl/: اسم. شێواز؛ ڕواڵ؛ ڕەوشت؛ زیّ؛ ئاکار ‹روال کار آنها پرداخت کارانه است، نه حقوق: شێوەی کاری ئەوان دانی کارانەیە نەک مووچە›.

**روان**¹ / ravān/: اسم. ڕەوان: ١. گیان؛ گیون؛ گان؛ جان؛ کۆمەڵەی هێزی هەستی و جمشتی گیاندار ٢. ڕۆح؛ کۆمەڵەی توخم و هێزی هزری، عاتیفی و کردەوەیانە.

**روان**²: صفت. ڕەوان: ١. وەگەڕ؛ قەڕێژ؛ بە تایبەتمەندی گت نەکردن لە ڕۆییندا ‹آب روان: ئاوی ڕەوان› ٢. بە لێهاتوویی بزوانەوە ‹ریگ روان: ڕملی ڕەوان› ٣. فێر؛ هۆژاندی؛ دەرخ ‹آزاد درسش را خوب روان بود: ئازاد دەرسەکەی باش ڕەوان بوو›.

**روان**³: قید. لە ڕویشتندا؛ لە چووندا؛ بەگەڕ؛ وەگەڕ؛ خەریکی چوون ‹به سوی خانه روان بود: بەرەو ماڵ لە ڕویشتندا بوو›.

**روانبرق** / ravānbarq/: [فارسی/ عربی]/اسم. ئیلیکترۆدینامیک؛ زانستیّ کە دەپەرژێتە سەر پێوەندی نێوان دیاردەگەلی بەرقی، مەگنەتیسی و میکانیکی.

**روانبرقی** / ravānbarqî/: [فارسی/ عربی]/اسم. ئیلیکترۆدینامیکی؛ سەر بە ئیلیکترودینامیک.

**روان‌پریش** / ravānparîš/: صفت. ڕەوان نەخۆش؛ تووشیاری نەخۆشی ڕەوانی.

**روان‌پریشی** / ravānparîšî/: اسم. نەخۆشی ڕەوان؛ نەخۆشینی ڕەوانی کە گەزن لە کەسایەتی نەخۆش دەدا و لە چۆناوچۆنی هزر و بیری خۆی و ڕاستیگەلی دەرەوە، بیّ‌ئاگای دەکا.

**روانپزشک** / ravānpezešk, -pezešg، ـها؛ ـان/:

/اسم. بژیشکی ڕەوان.

**روانپزشکی** / ravānpezeškî, -pezešgî/: /اسم. زانستی بژیشکی ڕەوان؛ لقیٚ لە بژیشکی کە تایبەتە بە ناسین و لابردنی نەخۆشیگەلی ڕەوان.

**روان تنی** / ravāntanî/: صفت. جۆریٚ نەخۆشی ڕەوان کە لەشیش تووش دەکا.

**رواندا**ز / rû'andāz ، ـها/: اسم. خومام؛ لەش‌پۆش؛ پەتوو، لیٚف، مەلافە و... کە لە کاتی خەو یان ڕاکشاندا بە خۆیدا دەدەن.

**روان‌درمانی** / ravāndarmānî/: اسم. دەرمانی نەخۆشیەکانی ڕەوان بە قسە و کار و کایە و دەوا.

**روان‌رنجور** / ravānrancûr/ ☜ **روان‌نَژند**

**روان‌رنجوری** / ravānrancûrî/ ☜ **روان‌نَژَندی**

**روانساز** / ravānsāz ، ـها/: اسم. ڕەوانساز؛ ماکیٚ کە بۆ کەمکردنەوەی تیٚک‌گیرانی نیٚوان بەشگەلی جوولەوەری ماشین بەکاردیٚ (وەک: ڕۆن و گریس).

**روان‌سنجی** / ravānsancî/: اسم. دەروونپیٚوی؛ پیٚوانی ماوە و توندی گەڕیانی دەماری لە لەشدا.

**روانشاد** / ravānšād/: صفت. ڕۆحشاد؛ خاوەن ڕۆحیانەتی شاد لە بەر ئاکاری پەسندی ماوەی ژیانی (بۆ مردووان).

**روان‌شناختی** / ravānšenāxtî/: صفت. سەر بە دەرون‌ناسی.

**روان‌شناس** / ravānšenās ، ـها؛ ـان/: اسم. ڕەوان‌ناس؛ کەسیٚ کە خاوەن زانست و ئەزموونی ڕەوان‌ناسیە.

**روان‌شناسی** / ravānšenāsî/: اسم. ڕەوان‌ناسی؛ زانستی تۆژینەوە و لیٚڕوانینی دیاردە و کردەوەگەلی ڕەوانی (وەک هزر، بیر، هەست، تیٚگەیشتن، تیفکرین، ئاکار) و شیٚوەی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئاڵۆز بوونیاندا.

◙ **روان‌شناسی اجتماعی**: ڕەوان‌ناسی کۆمەلایەتی؛ بەشیٚک لە ڕەوان‌ناسی کە بە لیٚڕوانینی ئاکاری گرۆگەل و کارلیٚکردنی تاک و کۆمەڵ لە سەر یەک دەپەرژیٚ.

**روان شناسی افتراقی**: ڕەوان‌ناسی جیاوازی؛ بەشیٚک لە ڕەوان‌ناسی کە بە لیٚکدانەوەی جیاوازیگەلی دەروونی و ئاکاری نیٚوان گرۆ و تاکەگەلی جۆراوجۆر دەپەرژیٚ.

**روان‌شناسی بالینی**: ڕەوان‌ناسی سەرینی؛ لیٚکدانەوەی بارودۆخ و دیمانەی حالەتگەلی نەخۆشی ڕەوانی لە سەرینی نەخۆشدا.

**روان‌شناسی تربیتی/ پرورشی**: ڕەوانناسی پەروەردەکاری؛ کەڵک وەرگرتن لە بنەماگەلی ڕەوان‌ناسی بۆ فیٚرکردن و ڕاهیٚنان.

**روان‌شناسی تکوینی**: ڕەوان‌ناسی پیٚکهاتەیی؛ شیٚوەییٚک لە ڕەوان‌ناسی کە دیاردەگەلی زەینی و کرداری لە ڕیٚگای لیٚکدانەوەی سەرچاوە و ڕەوتی گەشەسەندنیانەوە هەڵدەسەنگیٚنیٚ.

**روان‌شناسی جنایی**: ڕەوان‌ناسی تاوانکاری؛ زانستی لیٚکدانەوەی هاندەرگەلی دەروونی بۆ تاوانکاری.

**روان‌شناسی رشد**: دەروون‌ناسی گەشە؛ کار و زانستی لیٚڕوانینی گۆڕانکاری و تایبەتمەندیگەلی ڕەوانی سەرچاوەگرتوو لە سەردەمی گەشە کردن و گەورە بووندا.

**روان‌شناسی شخصیّت**: ڕەوان‌ناسی کەسایەتی؛ کار و زانستی لیٚکدانەوەی لایەنە جۆراوجۆرەکانی کەسایەتی مرۆ لە بواری ڕەوان‌ناسیەوە.

**روان‌شناسی صنعتی**: ڕەوان‌ناسی پیشەیی؛ کار یا ڕەوتی بەکار هیٚنانی شیٚوەگەلی دەروون‌ناسی لە بواری سەنعەت و ئابووریدا (وەک هەڵبژیٚری و ڕاهیٚنانی کارگەران، شیٚوەگەل

و هەلومەرجی کار و...).

**روانشناسی عمومی:** ڕەوانناسی گشتی؛ کار یا ڕەوتی لێکدانەوەی قانوون و بنچینەگەلی گشتی کە بە سەر مێشکدا زاڵن.

**روانشناسی کاربردی:** ڕەوانناسی کاربەری؛ بەشێک لە ڕەوانناسی کە تێدەکۆشێ دەسهاتگەلی خۆی لە کاروباری ڕۆژانەی ژیاندا بەکار بێنێ.

**روانشناسی کودک:** ڕەوانناسی منداڵ؛ بەشێک لە دەروونناسی کە لە زەین و ئاکاری مرۆڤ، لە سەردەمی لەدایکبوونەوە تا سەرەتای پێگەیشتن دەتۆژێتەوە.

**روانشناسی مدیریت:** ڕەوانناسی کارگێڕی؛ لێکدانەوەی شێوەگەلی جووڵانەوە لەگەڵ کارمەندان و کارێنەرانی ڕێکخراوەیەک.

**روانشناسی مقایسه‌ای:** ڕەوانناسی بەراوردی؛ بەشێک لە دەروونناسی کە بە هەڵسەنگاندنی جووڵانەوەی گیانەوەران لە ناوخۆیان و لەگەڵ مرۆڤدا دەپەرژێ.

**روانشناسی یادگیری:** ڕەوانناسی فێر بوون؛ بەشێک لە دەروونناسی کە بە توێژینەوەی چۆنیەتی فێر بوونی ژینەوەران، بەتایبەت مرۆڤ دەپەرژێ.

**روانکاو** / ravānkāv ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ڕەوانکۆڵ؛ ڕەوانناس یان دەروونبژیشکێ کە بە پێی بنەماگەلی دەروونکۆڵی بە توێژینەوە و ناسینەوە و چارەسەری نەخۆشیگەلی دەروونیەوە دەپەرژێ.

**روانکاوی** / ravānkāvî/: *اسم.* ڕەوانکۆڵی؛ شیکاری ڕەوان؛ شێوەیێک لە ڕەوانناسی و دەرمانی نەخۆشیگەلی دەروونی کە زیگموند فرۆید (۱۸٦۵-۱۹۳۹ زایینی) بەدیهێنا و بنەڕەتەکەشی لێکۆڵینەوە لە ڕابردوو، هەڵسوکەوتی بنەماڵەیی، ئەوین و هەوەیاگەلی نەخۆشە، بۆ دۆزینەوەی هۆی نەخۆشی و ناساندنی بە خودی نەخۆش و هاندانی بۆ بەرەنگار بوونەوە لەگەڵیدا: **آنالیز روانی**

**روانگردان** / ravāngardān/: *صفت.* ڕەوانگۆڕ؛ بە تایبەتمەندی کارتێکەری لە سەر بارگەلی زەین و توانی گۆڕانیان ‹داروهای روانگردان: دەرمانگەلی ڕەوانگۆڕ›.

**روان‌نژند** / ravān.najand ، ـها؛ ـان/: *صفت.* دەروونپەژار؛ بەرکەوتووی دەروونسووتاوی: **روان‌رنجور**

**روان‌نژندی** / ravān.najandî ، ـها/: *اسم.* دەروونپەژاری؛ هەر کام لە پشێویگەلی عاتیفی یان مێشکی کە لە ڕەواننەخۆشی کەمتر مەترسیدارە و کەسی تووشیار، هێشتا پێوەندی خۆی لەگەڵ ڕاستیدا بە تەواوی نەبڕیوە و کەسایەتی تا ڕادەیێ سنووری خۆی ڕادەگرێ، بەڵام بەوەشەوە ئەو کەسە لەگەڵ بار و دۆخی ئاقاریدا، ئاکارێکی شیاو و گونجاوی نیە: **روان‌رنجوری**

**روان‌نویس** / ravān.nevîs ، ـها/: *اسم.* ڕەواننووس؛ چەشنێ پێنووسی نووکساچمەیی کە جێ جەوهەرەکەی هەر لە کارخانەدا پڕ کراوە و تەڕ و ڕەوان دەنووسێ.

**روانه** / ravāne/: *قید.* ڕوانە؛ ڕەوانە؛ ڕوونیا؛ بەڕێوە؛ وەڕێکەوتوو؛ لە چووندا؛ خەریکی چوون بۆ شوێنێک.

▣ **روانەی بازار کردن:** *[مجازی]* ناردن بۆ بازاڕ؛ ناردنە بازاڕ؛ نیشاندان بۆ فرۆشتن ‹ماه آینده محصولات جدید خود را روانه‌ی بازار می‌کنیم: مانگی داهاتوو بەرهەمە تازەکانمان دەنێرین بۆ بازاڕ›.

هەروەها: **روانەی بازار شدن**

**روانەی بیمارستان کردن:** *[کنایی]* خستنە نەخۆشخانەوە؛ ئازار پێگەیاندن. هەروەها: **روانەی بیمارستان شدن**

**روانە شدن:** وەڕێکەوتن؛ کەوتنە ڕێ؛ کەوتەی ڕا؛ ڕۆیین؛ چوون؛ لوەی؛ ڕەونیا

بیەی ‹از آن جا روانەی اروپا شد: لەوێوە بەرەو ئورووپا وەڕێ کەوت›.

روانه کردن: ناردن؛ هەناردن؛ بەڕێ کردن؛ کیانای؛ کیاستەی؛ کیاسەی ‹حجاج را روانەی مکّه کردند: حاجیەکانیان نارد بۆ مەککە›.

روانەی قبرستان کردن: *[کنایی]* هەناردن بۆ ئەو دونیا؛ ناردن بۆ ئەو دونیاکە؛ ناردنە ئەو دونیا؛ کوشتن؛ مرنەی ‹این آقای دکتر خیلیها را تا حالا روانەی قبرستان کرده است: ئەم جەنابی دوکتورە تا ئێستا زۆر کەسی هەناردووە بۆ ئەو دونیا›.

هەروەها: **روانەی قبرستان شدن**

**روانی** [1] / ravānî/: *اسم.* ڕەوانی؛ تراوی؛ بار یان چۆنیەتی شل/ تەڕ بوون ‹گرما موجب روانی عسل می‌شود: گەرما دەبێتە هۆی ڕەوانی هەنگوین›.

**روانی** [2]: *صفت.* ڕەوانی: ١. سەر بە ڕەوان ‹وضع روانی او مساعد نیست: باری ڕەوانی باش نیە› ٢. ـها/ *[گفتاری]* لێوە؛ دین؛ بەرکەوتووی نەخۆشی ڕەوانی ‹آخرش با این کارها بچە را روانی می‌کنی: بەم کارانەت ئاخری منداڵەکە لێوە ئەکەی›.

**روایات** / ravāyāt, revāyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **رَوایَت**

**روایت** / ravāyat, revāyat ، ـها؛ روایات/: [عربی] *اسم.* ١. کار یان ڕەوتی گێڕانەوە؛ وتن؛ گێلنایوە؛ ئەوەگێلنەی؛ گەڕانەوەی هەواڵ یان باسێک لە زمانی کەسێکی ترەوە ‹از قول پدرش روایت می‌کرد: لە زمان باوکیەوە دەیگێڕایەوە› ٢. *[اسلام]* ڕیوایەت؛ وتە، هەواڵ یان باسێ کە هی پێغەمبەر یان پیاوە ئایینیەکانی تر بێ. هەروەها: **روایت کردن**

**روایی** [1] / ravāyî/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* ١. برەو؛ باو؛ ڕمێن؛ ڕەواج ٢. ڕەوایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕەوا بوون * **روائی**

**روایی** [2]: *صفت.* چیرۆکین؛ گێڕانەوەیی؛ وەک چیرۆک؛ چیرۆکاسا ‹شعر روایی: شیعری چیرۆکین› * **روائی**

**ـــ روایی** [3]: *پیواژه.* ١. ـــ رانی؛ پێک هاتن؛ کودان؛ بەدیهاتن ‹کامروایی: کامرانی› ٢. ـــ روایی؛ ڕوان؛ بەڕێوە چوون ‹فرمانروایی: فەرمانڕەوایی› * **ـ روائی**

**ـ روئی** / rû'î/ ☜ **ـ رویی**

**روئیدن** / rû'îdan/ ☜ **روییدن**

**روئین‌تن** / rû'întan/ ☜ **رویین‌تن**

**ـ روب** / rûb/: *پیواژه.* ـ لۆ؛ ـ ڕۆ؛ ـ ماڵ؛ ڕاماڵ؛ ڕادەر؛ بماڵ ‹برفروب؛ خاکروب: بەفرەلۆ؛ خۆلماڵ›.

**روبات** / robāt/: [انگلیسی] ☜ **رُبات**

**روباتیک** / robātîk/: [انگلیسی] ☜ **رُباتیک**

**روباز** / rûbāz/: *صفت.* ڕووباز؛ ڕوواز؛ سەرواز؛ بەبێ میچ، دەرپۆش، ڕووکێش یان لەمپەر ‹ظرف روباز: دەفری ڕووباز›.

**روبان** / rûbān ، ـها/: [فرانسوی از هلندی] *اسم.* قەیتان؛ قەیتانە؛ قردێلە؛ شەهبەد؛ بەنۆک؛ سارغی؛ نەوارێکی (زۆرتر) هەورێشم یان هەودای دەستکرد کە بۆ جوانی بە گنجیەوە دەدوورن یان بە شتێکیەوە دەبەستن.

**روباه** / rûbāh/: *اسم.* ١. ـها؛ ـان/ ڕێوی؛ رویقی؛ ڕوقی؛ چتر؛ چیتر؛ ڕواس؛ ڕواسە؛ ڕوا؛ ڕوو؛ لو؛ لوویە؛ لوی؛ لووی؛ لودی؛ گیانەوەری گوهاندار لە بەرەی سەگ، بە پێی کورت، جەستەی درێژ، گوێی زل، قەپۆزی نووک تیژ، کلکی درێژی کولکن و برێکیان بە کەوڵی خەزەوە ٢. *[نجوم]* وێنەی گەردوونی لە ئاسمانی لەتەگۆی باکووریدا کە لە نێوان وێنەگەلی دولفین و تیرهاوێژدایە: **ثعلب**

**روبراه** / rûberāh/: *صفت.* ١. بەرهەڤ؛ ساز؛ ئامادە ‹مغازه تا آخرماه روبراه می‌شود: دووکانەکە هەتا سەری مانگ بەرهەڤ دەبێ› ٢. ڕێکوپێک؛ تەکووز ‹کارها را روبراه کرد: کارەکانی ڕێکوپێک کرد› ٣. *[مجازی]* نەرمونیان؛ ڕام؛ دروست ‹آدم روبراهی است: بنیادەمێکی نەرمونیانە›.

**روبرو** [1] / rûberû/: *اسم.* ڕووبەڕوو؛ ڕووەوڕوو؛

ڕوەڕوو؛ ڕوی‌بڕوی؛ ڕوولەڕوو؛ هەڤبەر؛ هەمبەر؛ همبـەر؛ هومبـەی؛ هەنـداڤ؛ هەنـداو؛ هڤـشەر؛ ڤەراڤەر؛ وەراوەر؛ وەرانوەر؛ بەرانبـەر؛ ڕووبـەڕوو؛ ڕووبار؛ قاچی؛ مشلاق: ۱. شوێنی جێگرتنی دوو شت لـە دوو سـەری هێـڵێک یـان دوو سـەری مەودایێکەوە ‹روبرو را نگاه کن: بڕوانە بۆ ڕووبـەڕوو› ۲. شوێنی دووگیانەوەر کە ڕوویان لە یـەک بـێ ‹متهم را با شاهد روبـرو کردنـد: تۆمـەتباریان لەگـەڵ گەواهەکە ڕووبەڕوو کردەوە› ۳. هەر یەکە لـە دوو بەرەوگەیەک کە دژبەری یەکترین ‹ماشینی که از روبـرو مـی‌آمـد او را زیـر گرفـت: ماشـینێ کـە لـە ڕووبەڕووەوە دەهات کردیە ژێرەوە›.

**روبرو**[2]: *صفت.* بەرانبەر؛ ڕووبـەڕوو ‹مغازەی روبرو مـال حـاجی آقاسـت: ئـەو دووکانـە بەرانبـەرە، هـی مامحاجیە›.

**روبرو**[3]: *قید.* بەرانبەر؛ ڕووبەڕوو؛ لە ڕووبەڕوودا؛ لە بەرامبەردا؛ لە بەرانبـەرەوە؛ وەراوەرەوە ‹روبـروی من ایستاد: بەرانبەرم ڕاوەستا›.

▣ **روبرو شدن:** تووش هـاتن/ ئامـەی؛ تووشـیار هاتن: ۱. ڕووبەڕوو بـوون؛ ڕووبـەڕوو بوونـەوە؛ تووش بوون؛ هەڵـتەقین؛ تەفەقـە هـاتن؛ لـە هەمبەر شتێکەوە قوت بوونـەوە ‹با آزاد روبرو شدم: تووش ئازاد هاتم› ۲. تووشیار بوون؛ سـەر و کار پەیداکردن لەگـەڵ گـیر و گرفـت یـان کەتنێکدا ‹با مـشکل روبـرو شـد: تووشـی گرفـت هات›.

**روبرو کردن:** ڕووبەڕووکردنـەوە؛ هەڤـرووکرن؛ بەرەوڕووکردنــەوە؛ هێنانــە هەمبــەر یەکــەوە ‹متهم را با شاهد روبرو کردنـد: تۆمەتباریان لەگـەڵ گەواهەکەدا ڕووبەڕوو کردەوە›.

**روبروئی** / rûberû'î/ ☜ **روبرویی**

**روبرویـی**[1] / rûberûyî/: *اسـم.* ۱. ڕووبـەڕوویی؛ بــەرەوڕوویی؛ دۆخ یــان چۆنیــەتی بەرامبــەر بوونەوە؛ تووش هاتن/ بـوون؛ ڕووبـەڕوو بوونـەوە ‹در موقع روبرویی با چنین وضعی باید آمـادگی کـافی داشـته باشـی: کـاتی بەرامبەر بوونەوە لەگـەڵ ئـاوا دۆخێکدا دەبێ وریـا بی› ۲. کار یان ڕەوتی لێـک وەسـتانەوە؛ بـەگژ یەکـدا چـوون و ڕووبـەڕووی یەک وەستان ‹تو می‌خواهی ما را به روبرویی بـا هـم واداری: دەتەوێ لێکمان بەدەستبیبەوە› * **روبروئی**

**روبرویی**[2]: *صفت.* ڕووبـەڕوو؛ بەرانبـەر؛ وەراوەر؛ ڕووبەڕوویین؛ بەرانبەری ‹خانـەی روبرویـی: ماڵـی ڕووبەڕوو›: **روبروئی**

**روبل** / rûbl/: [روسی]/*سم.* ڕوبل؛ یەکەی پـارەی ڕووسیا.

**روبنا** / rûbanā ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*سم.* ڕووچن؛ ڕووچین: ۱. سەرتەمەڵە؛ ئەو بەشە لە مـاڵ کـە لــە ســەر بنچینەکەیــەوە دروســت دەکــرێ ۲. *[جامعه‌شناسی]* سەرچین؛ هـەر کـام لـە بنکـە کۆمەڵایەتیەکان (وەک بنەماڵە، دەوڵەت،...) کـە پیـشاندەری بـارودۆخی ئـابووری، فەرهـەنگی و ناوچەیی کۆمەڵگایەکە: **روساخت**

**روبنـــد** / rûband/: *اسـم.* ۱. ☜ **روبنـــده** ۲. *[گیاه‌شناسی]* پەڕەی کارک؛ ناسکە پەردەیەک کە لە قۆتەی کارکەوە بەرەو دەور و بەر نووساوە ۳. تـیرەک؛ تەمبــەڵ؛ کۆڵــەکەیێک کــە بــۆ پێوەلکـان و پتـەوکردنـەوەی دوولاقـی دنگـە (خەرپا) لە ناوەڕاستیەوە دایدەکوتن.

**روبنده** / rûbande ، ـها/: *اسم.* ڕووبەنند؛ ڕووبەنـە؛ ڕووبەن؛ پەچە؛ پێچە؛ پووشی؛ خێلی؛ پارچـەیێ کە (ژنان بەتایبەت) ڕوومەتیانی پـێ دادەپۆشـن: **روبند**

**روبوت** / robot/: [انگلیسی] ☜ **رُبات**

**روبوتیک** / robotîk/: [انگلیسی] ☜ **رُباتیک**

**روبوسی** / rûbûsî/: *اسم.* ماچوموچ؛ دەس‌ومۆچ؛ دەس‌وبۆس؛ دەس و موشتاق؛ ڕامووسانێ؛ کاری یـەکتر مـاچ کـردن، زۆرتـر بـۆ نیـشاندانی خۆشەویستی.

**روبه** / rûbah ، ـان/: *اسم. [مخفف، ادبی]* ڕێـوی؛ ڕووێ؛ ڕوڤی؛ لوو؛ لووی؛ ڕوا؛ ڕواسە؛ چتر؛ چیتر.

▣ روبه‌مزاج: ۱. ترسه‌نۆک؛ ترسه‌زاوه‌ر؛ که‌له‌زات ۲. فێڵباز؛ ته‌ڵه‌کچی؛ پێچ؛ ناڕاست.

**روبیدن** / rûbîdan/: *مصدر. متعدی.* // **روبیدی(رُفتی)**: مالیت؛ **می‌روبی**: ده‌مالی؛ **بِروب**: بماڵه// ماڵین؛ ڕاماڵین؛ گه‌سک‌دان؛ گزگ‌دان؛ ئه‌ره ماڵه‌ی؛ ماڵایره؛ ڕادان؛ دوور خستنه‌وه‌ی شتێک (به‌تایبه‌ت خۆڵ و زبڵ و به‌فر) به‌ که‌ره‌سه‌یێک له‌ شوێنێک و خاوێن‌کردنه‌وه‌ی ئه‌و شوێنه: **رُفتن** *[گفتاری]*. هه‌روه‌ها: **روبیدن**

■ **صفت مفعولی: روبیده** (ماڵێنراو)/ **مصدر منفی: نَروبیدن** (نه‌ماڵین)

**روبیدیم** / rûbîdiyom/: [فرانسوی]/*اسم.* روبیدیۆم؛ توخمێکی شیمیایی کانزایی، به‌ ژماره‌ی ئه‌تۆمی ۳۷ و کێشی ئه‌تۆمی ۸۵,٤٦، نه‌رم و سپی زێوی، که‌ خێرا له‌ هه‌وادا گڕ ده‌گرێ.

**روپوست** / rûpûst، ـها/: *اسم. [کالبدشناسی]* سه‌رپێست؛ چینی ده‌ره‌وه‌ی پێست، که‌ له‌ مۆرغه‌داراندا گرنج-گرنجه.

**روپوش** / rûpûš، ـها/: *اسم.* ۱. رووپۆش؛ پۆشه‌مه‌نیه‌ک به‌تایبه‌ت کراسی شۆڕ که‌ به‌سه‌ر جل‌وبه‌رگدا له‌به‌ری ده‌که‌ن ۲. رووکه‌ش؛ به‌ره؛ پۆشه‌نێک (له‌ کاغه‌ز، مقه‌وا، پارچه‌ یان نایلۆن) که‌ شتێکی ده‌نێو یان ده‌ژێر ده‌نێن.

**روپیه** / rûpîye/: [هندی]/*اسم.* رووپیه؛ یه‌که‌ی پاره‌ی هیند، پاکستان و برێ له‌ وڵاتانی هاوسێیان.

**روتختی** / rûtaxtî، ـها/: *اسم.* لێفک؛ لحێفک؛ چه‌رچه‌ف؛ په‌رده‌یێ که‌ به‌ سه‌ر ته‌ختیدا ده‌کێشن.

**روت کانال** / rûtkānāl/: [انگلیسی]/*اسم.* *[دندان‌پزشکی]* ڕوت‌کاناڵ؛ ڕه‌گ‌گه‌لی خوێنی له‌ ڕیشه‌ی دداندا.

▣ روت کانال کردن: رووت‌کاناڵ کردن؛ باز کردن و پاک و خاوێن‌کردنه‌وه‌ی ڕه‌گ‌گه‌لی خوێنی ڕیشه‌ی دیان بۆ پڕکردنه‌وه‌ی ددانی کرمۆڵ.

**روتنیم** / rûtenyom/: [فرانسوی]/*اسم.* ڕوتینیۆم؛ توخمێکی کیمیایی کانزایی به‌ ژماره‌ی ئه‌تۆمی ٤٤ و کێشی ئه‌تۆمی ۱۰۱,۰۷، خۆڵه‌مێشی ڕه‌نگ و تورت و ڕه‌قه‌ و له‌ ئاو و ئه‌سیدا ناتوێته‌وه‌. له‌ پیشه‌سازی وه‌ک ساناکه‌ر و ڕه‌قکه‌ره‌وه‌ له‌ ئالیاژدا به‌کاردێ.

**روتور** / rotor، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* ڕوتور: ۱. به‌شی سووڕێنه‌ری موتوری کاره‌با؛ ئارمیچر ۲. به‌شی سووڕێنه‌ری کۆمپریسۆر یان توربین ۳. چه‌کوشی کاره‌باری ئوتومبیل: **رُتور**

**روجامه** / rûcāme، ـها/: *اسم.* که‌وا؛ به‌رگێک که‌ به‌ سه‌ر جلی‌تردا ده‌یپۆشن.

**روح** / rûh، ـها؛ ارواح/: [عربی]/*اسم.* ڕۆح؛ روه: ۱. گیان؛ گان؛ گێون؛ جان؛ ڕه‌وان ۲. هه‌وێنی ژیان؛ هێز و گه‌وهه‌رێ که‌ هۆی ژیانی له‌شه ۳. هه‌وێن و هێمای په‌راسروشتی، هه‌تاهه‌تایی و غه‌یره‌ماکی ٤. *[مجازی]* هه‌وێن؛ لاگری؛ ئۆگره‌تی، ئه‌نگیزه و بزوێنه‌ری زه‌ینی ‹روح جلسه؛ روح قرارداد: هه‌وێنی کۆڕ؛ هه‌وێنی بڕیار› ۵. *[مجازی]* تین؛ هه‌ست و نست؛ هۆی جم و جووڵ، شۆر و سه‌رحاڵی ‹حرفهایش روح نداشت: قسه‌کانی تینی نه‌بوو› ٦. ناوه‌ندی به‌زه‌یی و هه‌ستی مرۆڤ ‹روح حساس؛ روح پژمرده: ڕۆحی به‌هه‌ست؛ ڕۆحی ژاکاو› ۷. تارمایی؛ تاپۆی غه‌یره‌مادی که‌سی مردوو ‹مگر روح دیدی؟: مه‌گه‌ر ڕوحت دیوه؟›.

**روحاً** / rûhan/: [عربی]/*قید.* به‌ ڕۆح؛ له‌ باری ڕۆحیه‌وه ‹روحاً افسرده بود: به‌ ڕۆح ژاکابوو›.

**روح‌افزا** / rûhafzā/: [عربی/ فارسی] *صفت.* گیان‌گه‌شێن؛ گیان‌به‌خش؛ ڕۆح‌په‌روه‌ر؛ هۆی باشتر بوونی حاڵه‌تی ڕۆحی مرۆڤ ‹محیط روح‌افزا: ده‌ڤه‌ری گیان‌گه‌شێن›.

**روح‌القدس** / rûholqodos/: [عربی]/*اسم.* ڕۆحی

پیرۆز؛ یەکێک لە سێ پایەی پیرۆزی دینی مەسیح.

**روحانگیز** / rûhangîz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دڵبزوێن؛ دڵڕفێن؛ دلگر؛ هۆی بەدیهاتن یان هاندانی هەستی خۆش ‹نوای روحانگیز موسیقی به گوش می‌رسد: دەنگی دڵبزوێنی مۆسیقا دەبیسرێ›.

**روحانی**[1] / rûhānî, ro:hānî، ـها؛ ـان؛ ـون/: [عربی]/*اسم.* مەلا؛ مەلا: ۱. کەسێ کە خەریکی ڕێبەری و بەڕێوە بردنی کار و باری دینیە ۲. کەسایەتی مەزهەبی؛ زانای ئایینی.

**روحانی**[2]: *صفت.* ڕۆحی: ۱. سەربەگیان. بەرانبەر: **جسمانی** ‹عوالم روحانی: دنیاگەلی روحی› ۲. خاوەنی گیانی پاک و بەرز ‹فضای روحانی: کەشی ڕۆحی›.

**روحانیت** / rûhānîyyat/: [عربی]/*اسم.* ۱. ڕۆحانێتی؛ ڕۆحانیەت؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی مەلا بوون ‹نشانەی روحانیت که تنها لباس نیست: تەنیا جلوبەرگ پیشاندەری ڕوحانێتی نیە› ۲. مەلایان؛ مەلای؛ کۆمەڵی مەلا؛ سەرجەمی مەلایان ‹روحانیت تشیع: مەلایانی شیعە›.

**روحانی‌نما** / rûhānînemā, ro:hānî-، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کۆلکەمەلا؛ کەسێ کە تەنیا بە ڕواڵەت مەلا بێ.

**روحبخش** / rûhbaxš/: [عربی/ فارسی] *صفت.* گیانبەخش؛ ڕۆحبەخش ‹گوش به آوای روحبخش خواننده می‌سپارم: گوێ بە دەنگی گیانبەخشی گۆرانی‌بێژ ئەسپێرم›.

**روحپرور** / rûhparvar/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ڕۆحپەروەر؛ ڕۆحگەشێن؛ هۆی پەروەرشت و بەرزکردنەوەی ڕۆح ‹نوای روحپرور: دەنگی ڕۆحپەروەر›.

**روحنواز** / rûhnavāz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بلاوێن؛ ڕۆحلاوێن؛ هۆی لاواندنەوەی هەست و دڵنەرمی ‹از نسیم روحنواز سحری بیدار شدم: بە سروەی بلاوێنی بەیان هەستام›.

**روحوضی** / rûhowzî, rûho:zî/: [فارسی/ عربی] ☜ نمایش روحوضی، **نمایش**

**روحی** / rûhî/: [عربی] *صفت.* ۱. ڕۆحی؛ دەروونی؛ سەر بە ڕۆح ‹آرامش روحی: سوکنایی روحی› ۲. ڕۆحینە؛ لە ڕۆح؛ لە جنس یان ئالیاژی کانزای ڕۆح ‹قابلمەی روحی: قاولەمەی روحینە›.

**روحیات** / rûhîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **روحیّە**

**روحیه** / rûhîyye، ـها؛ روحیّات/: [عربی]/*اسم.* حاڵ؛ ڕۆحیە: ۱. حاڵەتی عاتیفی (وەک شادی، هومێد یان خەم) یان ئاکاری کەس یان تاقمێک ‹روحیەی همکاری بر جمع ما حاکم بود: روحیەی ئاریکاری بەسەر کۆڕەکەماندا زاڵ بوو› ۲. لایەنی ئەرێنی ئەم حاڵەتە بەتایبەت هیوا و زات ‹به ما روحیه داد: روحیەی داینێ›. هەروەها: **روحیه دادن؛ روحیه داشتن**

**روخوانی** / rûxānî/:/*اسم.* ڕووخوێنی؛ کار یا ڕەوتی لە ڕوو خۆندنەوە؛ خوێندنەوەی بابەتێک لە ڕووی نووسراوەوە ‹سخنرانی که نبود، آمد چیزی را روخوانی کرد و رفت: وتاربێژی نەبوو، هات شتێکی ڕووخوێنی کرد و ڕۆی›.

**رود** / rûd، ـها/:/*اسم.* ۱. ڕووبار؛ ڕۆ؛ ڕوو؛ ڕویبار؛ ڕۆخانە؛ چەم؛ چۆم؛ گەڕی سروشتی ئاو لە بارستاییەکی زۆردا بۆ ماوەیەک (لانی‌کەم پتر لە دوو مانگ لە ساڵدا) کە بڕژێتە دەریاوە ۲. *[مجازی]* ڕووبار؛ ڕو؛ ڕۆ؛ ڕوو؛ ڕویبار؛ ڕۆخانە؛ چەم؛ چۆم؛ ئەوەی بەم شێوە بگەڕێ ‹رود خون: ڕووباری خوێن› ۳. *[قدیمی]* ڕوود؛ سازی ژێیی کە بە دەندووکە دەیژەنن.

▣ **رود خون**: *[مجازی]* ڕووباری خوێن؛ شەڕ و کوشتاری بێئامان و دژوار.

**رودار** / rûdār/: *صفت.* *[گفتاری]* ڕوودار: ۱. خاوەنی تایبەتمەندی یان توانایی جووڵانەوە لەگەڵ کەسانی‌تردا، بەبێ هەستی شەرمکردن

٢. ـها/ پڕروو؛ بێشەرم؛ بێحەیا؛ گوسارتمە.

**روداری** / rûdārî/: *اسم. [گفتاری]* ڕووداری؛ بار یان دۆخی ڕوودار بوون.

**رودپیچ** / rûdpîč/: *اسم. [زمین‌شناسی]* چۆمپێچ؛ وەرچەرخانێ لە مەرخی ڕووباردا کە زۆرتر دوای ماوەیەک وەک بازنەیێکی لێ‌دێ.

**رودخانه** / rûdxāne ، ـها/: *اسم.* ڕۆخانە؛ ڕووبار؛ ڕویبار: ١. بواری سروشتی و کەم و زۆر هەمیشەیی ڕوو ٢. چۆم؛ چۆمی؛ ڕووباری گەورە کە بڕژێتە دەریاوە.

**رودربایستی** / rûdarbāyestî/: *اسم.* ڕوودەربایسی؛ لە ڕوودامـاوی: ١. دۆخ یـان چۆنیەتی هەستی شەرم کردن لە بەجێ نەهێنانی داوا یان ئارەزووی کەسێک ‹در رودربایستی گیر کردم و نتوانستم جواب رد بدهم: کەوتمە ناو ڕوودەربایسیەوە و نەمتوانی جوابی بکەم› ٢. کەمڕوویی؛ شەرمێونی؛ هەست بەوەی کە پێویستە لە ڕووی کەسێکدا ڕەسمی بجووڵێتەوە ‹خیلی با او رودربایستی داشتم و حتی در حضور او بلند نمی‌خندیدم: لەگەڵیدا زۆر ڕوودەربایسیم هەبوو، تەنانەت لە لایدا بەرز پێ نەدەکەنیم›.

**رودررو** / rûdar.rû/: *قید.* ڕوویبار؛ ڕووبەڕوو؛ لە هەمبەر یەکتریەوە ‹رودررو همه چیز را بە او گفتم: هەموو شتێکم ڕوویبار پێ‌گوت›.

**رودست**[1] / rûdast/: *اسم. [مجازی، گفتاری]* گزی؛ تەڵەکە؛ فریو؛ فێڵ.

▣ **رودست خوردن**: فریو خواردن؛ هەڵخەڵەتان؛ دەسخەڕۆ بوون؛ دەست بە زاخا چوون ‹از یک پسربچه رودست خوردم: فریوی منداڵێکم خوارد›.

**رودست زدن**: فریو دان؛ فێڵ کردن؛ خەڵەتاندن؛ لاباندن؛ خەڵەتنای ‹غصه نخور، به من هم رودست زد: خەفەت مەخۆ، منیشی فریو دا›.

**رودست**[2]: *صفت.* باندەس؛ بالادەست؛ سەردەست؛ سەردەس؛ باشتر؛ سەرتر؛ تا.

▣ **رودست نداشتن**: باندەس نەبوون؛ باشتر یان سەرتر لە خۆی نەبوون ‹این کفشها رودست ندارد: ئەم پێڵاوانە باندەسیان نیە›.

**رودسنگ** / rûdsang/: *اسم. [زمین‌شناسی]* خڕکەبەرد؛ خڕەبەرد؛ دەستەبەرد؛ کۆپەڵ؛ خڕک؛ پەل؛ جمەخڕکێ کە لە لاپاڵێکدا بەرەو خوار دەبنەوە.

**رودشکن** / rûdšekan ، ـها/: *اسم. [زمین‌شناسی]* شوێنی کەم یان زۆر بوونەوەی لێژایی چۆم.

**رودک** / rûdak/: *اسم. [جانورشناسی]* چالەکە؛ چالک؛ چالگ؛ چالە؛ چوالوو؛ کوڕەبەش؛ کوڕەبەشە؛ کوڕەبەشەک؛ قوڕەبەشە؛ گۆڕهەڵکەنە؛ گیانەوەرێکی شەوگەڕی لەش‌قورس و ئەستوورە زەوی هەڵدەکۆڵێ.

**رودل** / rûdel/: *اسم. [گفتاری]* سەردڵ؛ ڕوودڵ؛ سقڵ؛ گرفت؛ نەخۆشی قورس بوون و داهێزانی سک لە بەر پڕی گەدە.

▣ **رودل کردن**: سەردڵ گرتن؛ گرفت کردن؛ تووشی نەخۆشی و ژانی گەدە بوون (بە هۆی پڕی و قورسیەوە).

**رودوزی** / rûdûzî ، ـها/: *اسم.* سەردروو؛ جۆرە دروونێ کە تەقەڵەکان لە دەرەوە بن.

**روده** / rûde ، ـها/: *اسم.* ڕیخۆڵە؛ ڕۆخڵە؛ لەغروو؛ ڕیڵەخۆ؛ ڕێخەڵۆ؛ لیخەروو؛ لەخەروو؛ ڕیخەڵۆکە؛ ڕیخەڵۆک؛ لویخەڕۆ؛ ڕۆڵەخوای؛ ڕۆخڵا؛ ڕیڤی؛ ڕیڤیک؛ ڕویفیک؛ ڕۆڤیک؛ ڕۆدێ؛ ڕووڤی؛ ئور؛ پزور؛ بەشێکە لە لوولەی گەوارشت لە بەر گەدەوە هەتا سوو.

▣ **رودهٔ اعور** ☜ **رودهٔ کور**

**رودهٔ باریک** ☜ **رودهٔ کوچک**

**رودهٔ بزرگ**: زبلەک؛ سور؛ ڕیخۆڵە ئەستووە؛ ڕۆڤی ڕەش؛ ڕیڵەخۆی گەورە؛ ڕۆڤی ستوور؛ بەشێ لە ڕیخۆڵە بریتی لە ڕیخۆڵەکوێرە، قوولون (کوولون) و ڕیخۆڵەی ڕاست: **رودهٔ فراخ**

**روده‌ی لاَئِـم**: ڕیخۆڵـه‌ی بـه‌تـاڵ؛ ڕیخۆڵـه‌ی به‌ڕۆژوو؛ به‌شێ له ڕیخۆڵه‌ی باریک لـه نێـوان دوانزه‌گرێ و ئیلیۆمدا.

**روده‌ی فراخ** ☜ **روده‌ی بزرگ**

**روده‌ی کوچـک**: ڕیخۆڵـه باریکـه؛ ڕیخۆڵـه باریک؛ ڕیخۆڵه بچووک؛ ڕۆڤی زراڤ؛ به‌شـێک له ڕیخۆڵه بریتی لـه دوانزه‌گـرێ، ڕیخۆڵـه‌ی به‌تاڵ و ئیلیۆم: **روده‌ی باریک**

**روده‌ی کـور**: ڕیخۆڵــه کــوێره؛ تووره‌کــه ئاساییک له سه‌ره‌تای کوولونی ژووره‌ڕۆوه کـه ئه‌پاندیس له ئاخریدایه: **روده‌ی آعوَر**

▣ **روده‌ی راست در شکم کسی نبودن**: *[مجازی]* وه‌ک گوریسی ناو هه‌نبانه بـوون؛ حـه‌وت ڕۆژ به‌ر له شه‌یتان له دایک بوون؛ زۆر بـه پـێچ و پا بوون؛ درۆزن و شه‌للاتی بوون ‹این آقـا یـک روده‌ی راست در شـکمش نیـست: ئـه‌م پیـاوه وه‌ک گوریسی ناو هه‌نبانه‌یه›.

**روده‌بر** / rûdebor/ ☜ **روده‌بر شدن**

▣ **روده‌بُر شدن**: *[مجازی]* ناوسـک بـڕان؛ وڵـک بڕان؛ ژان کردنی ماسـوولکه‌ی زگ بـه هـۆی پێکه‌نینی زۆره‌وه: **روده‌بر**

**روده‌بند** / rûdeband/: *اسم. [کالبدشناسی]* کنتـه؛ چینێکی پان له کراسبه‌زه‌وه که ڕیخۆڵه‌کان بـه ڕووبه‌ری پشتی سکه‌وه ده‌نووسێنێ.

**روده‌دراز** / rûdederāz/: *صفت. [کنایی، گفتاری]* نووزه‌درێژ؛ زۆربڵێ؛ لاکـێش؛ زۆربێـژ؛ چه‌نـه‌باز؛ چه‌نـه‌واز؛ چه‌نـه‌روو؛ چنـروو؛ چه‌نه‌چـه‌قاوه؛ زۆر قسه‌که‌ر ‹از آن آدمهای روده‌دراز و حـراف اسـت: لـه‌و بنیاده‌مه نووزه‌درێژ و زۆربێژانه‌یه›.

**روده‌درازی** / rûdederāzî ، ـهـا/: *اسم. [کنایی، گفتاری]* نووزه‌درێژی؛ چه‌نه‌بازی؛ لاکێشی؛ گیـره؛ کار یا دۆخی چه‌قـه‌کردن و چه‌نـه لێـدانی زۆر ‹چـرا ایـن قـدر روده‌درازی مـی‌کنـی؟: بـۆ ئه‌مه‌نـده نووزه‌درێژی ده‌که‌ی؟›.

**رودیم** / rod(i)yom/: [فرانسوی] ☜ **رُدیُم**

**روراسـت** / rûrāst/: *صـفت. [مجـازی، گفتـاری]* یه‌کـڕوو؛ ڕووڕاسـت؛ ڕووڕاس؛ بـێ‌ڕیـا؛ ڕاسـت و ڕه‌وان؛ بـێ‌درۆ و دووڕوویـی ‹بهتـر اسـت بـا مـن روراست باشی: چاتره له‌گه‌ڵمدا ... بی!›.

**روراست** : *قید. [گفتاری]* ڕه‌پ‌وڕاست؛ ڕاس‌وپاک؛ ڕووڕاست؛ ڕۆڕاسـت؛ ڕاسـت‌وێژانـه؛ پـان‌بـه‌پان؛ به‌ڕاشکاوی ‹هر چه بود، ... همه را تعریـف کـرد: هه‌ر چی بوو، ... هه‌مووی گێڕاوه›.

**رورو ک** / rowrovak, ro:rovak ، ـهـا/: *اسم.* ســـه‌لالیک؛ ســـه‌لیلانک؛ ڕه‌وڕه‌وه؛ وه‌ڕه‌وه‌ڕه؛ پێچـــۆک؛ ته‌شـیره؛ که‌ره‌ســـه‌یێکی چکۆلـه و چه‌رخداره زارۆی پێ فێره ڕۆیشتن ده‌بێ.

**روز** / rûz ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ڕۆژ: ۱. ڕۆ؛ ڕۆج؛ ڕۆچ؛ ڕووژ؛ مه‌ودای نێوان دوو شه‌و که به ڕوون بوونی هه‌وا هه‌تا تاریک بوونه‌وه‌ی دیـاری ده‌کـرێ ‹در تابستان روز از شب طولانی‌تر است: له هاویـنـدا ڕۆژ لـه شه‌و درێژتره› ۲. شـه‌و و ڕۆژ ‹ده ... در بیمارسـتان بـستری شـد: ده ... لـه نه‌خۆشـخانه‌دا کـه‌وتبوو› ۳. ماوه‌یێ که تـه‌نێکی ئاسمـانی ده‌وری‌ـک بـه ده‌ور خولگـه‌ی خۆیـدا ده‌سـووڕێته‌وه ٤. کـات؛ گاڤ؛ هنگاڤ؛ وه‌خت ‹روز کار؛ روز تعطیل؛ روز عید: روژی کـــار؛ ڕۆژی پـــشوودان؛ ڕۆژی جێـــژن› ٥. ســاڵوه‌گــه‌ڕی ڕێـوڕه‌سمێکی تایبـه‌ت ‹روز کارگر؛ روز مـادر: ڕۆژی کرێکار؛ ... ی دایک› ٦. (لـه حاڵه‌تی کۆدا) ڕۆژگار؛ ڕۆزگار؛ ڕۆزیـار؛ ڕۆژان ‹آن روزها ارزانی بود: ئه‌و ... ه هه‌رزانی بوو›.

▣ **روز از نو، روزی از نو**: *[مجازی]* سه‌ر له نـوێ؛ له سه‌رڕا؛ دیسانه‌که؛ دیسانه‌وه؛ هـه‌م‌دیـسان؛ هه‌میسان؛ هه‌مدیس؛ هه‌م‌دواره ‹وقتی از زندان آزاد شد، باز ...، امشب ایـن خانـه را خالی کرد، فرداشب آن ماشین را دزدید، تا دوباره گیـر افتاد: کاتێـک لـه به‌ندیخانـه بـه‌ردرا، ...، ئه‌مشه‌و ئه‌م ماڵه‌ی چه‌پاو کرد، سبه‌ی شـه‌و ئـه‌و ماشینه‌ی دزی، هه‌تا دیسانه‌وه گیرا›.

**روز بازخواست**: ڕۆژی پـساتێ؛ ڕۆژا پـه‌سـلان؛

رۆژا پەسـلانێ؛ رۆژی پەسـلان؛ رۆژا پاشـین؛ دواڕۆژ؛ رۆژی قیامەت: **روز قیامت**
روز بـه روز: رۆژ بـه ڕۆژ؛ رۆژ وه رۆژ؛ رۆبـەرۆ؛ هـەموو ڕۆژێ؛ هـەر ڕۆژ ‹روز بـه روز حـالم بـدتر می‌شد: رۆژ بە رۆژ حالم خرابتر دەبوو›.
روز تولـد: زارۆژ؛ رۆژی لـەدایک بـوون؛ رۆو پەیدا بیەی.
روز جزا: رۆژا پاشین؛ رۆژی پەسلان؛ نیروانـا؛ نیرڤانا؛ رۆژی قیامەت: **روز قیامت**
روز حشر: رۆژی پەسلان؛ نیروانا؛ رۆژاپاشـین؛ رۆژاسلاتێ؛ رۆژی پەسلان؛ رۆژی پساتێ؛ رۆ و حەشری؛ رۆژی هەسـتانەوەی دوای مـەرگ: **روز قیامت**
روز خورشیدی: رۆژی خۆری؛ رۆژی هەتاوی؛ مەودای نێوان دووجار تێپەڕینی پەیتا-پەیتای رۆژیار لە سەر شوێنێکی دیاریکراو لە زەویدا.
روز رستاخیز: پەسلان؛ سەلا؛ رۆژی سەلا: **روز قیامت**
روز سیاه: *[مجازی]* تەنگانە؛ رۆژی رەش؛ رۆژی تەنگ؛ کاتی گیروگرفت و دەورەدانی دژواری و ڕووداوی ناخۆش ‹پـول سـفید بـرای روز سیاه است: پارەی سپی بۆ رۆژی رەشە›.
روز شـمار: رۆژی پەسـلان؛ رۆژی هەسـتانەوە دوای مەرگ.
روز قیامـت: *[اسـلام]* رۆژی پەسـلان؛ رۆژی پساتێ؛ رۆژاپەسلانێ؛ رۆژی سەر هەڵدانەوەی پاش مردن کە بـە چاکـە و خراپـەی خەڵـک ڕادەگەن: **روز بازخواست؛ روز جـزا؛ روز حـشر؛ روز رستاخیز؛ روز محشر**
روز کـارگر: رۆژی کاریگـەر؛ رۆژی کرێکـار؛ رۆژێکی دیاریکراو بۆ ڕێزگرتن لە پلە و پایـەی کرێکاران (رۆژی یەکەمی مانگی مەی، بەرامبـەر بە یـازدەی گـولان). هـەروەها: **روز مـادر؛ روز معلم**
روز محشر: رۆژی پەسلان: **روز قیامت**

روز نجومی: رۆژی سـتێرکی؛ مـەودای نێـوان دوو جار تێپەڕینی ئەستێرەیەک لە بەرامبـەر شوێنێکی دیاریکراو لە زەویدا.
روز نحس: زیپ؛ رۆژی تووش و شـووم؛ رۆژێ کە هەڵکەوت و ڕووداوی ناخۆشی زۆرە.
**روز**[۲]: *قید.* رۆژ؛ بە رۆژدا؛ لە ڕۆژا؛ رۆنە ‹برو روز بیا؛ روز کار می‌کنیم و شب می‌خوابیم: برۆ بە ڕۆژدا وەرەوە، رۆژ کار دەکەین و شەو دەنووین›.
**روزافـزون** / rûzafzûn/: *صـفت. [مجـازی]* بـە تایبەتمەندی فرە/ زۆر بوونی پەیتا-پەیتاوە.
**روزامد** / rûzāmad/: *صفت.* بـە ڕۆژ؛ گونجـاو و هاوڕێ لەگەڵ رۆژ یان کاتی ئێستادا. هـەروەها: **روزامد بودن؛ روزامد شدن؛ روزامد کردن**
**روزانـه**[۱] / rûzāne/: *صفت.* رۆژانـە: ۱. رۆژینـە؛ هەر رۆژی؛ هی رۆژێ؛ پێوەندیدار یان سـەر بـە رۆژێک ‹غذای روزانه؛ مـزد روزانـه: چێـشتی ڕۆژانـە؛ مزی روژانە› ۲. رۆژین؛ پێوەندیدار یان سـەر بـە رۆژ ‹کـار روزانـه؛ مدرسـەی روزانـە: کـاری ڕۆژانـە؛ قوتابخانەی رۆژانە›.
**روزانه**[۲]: *قید.* رۆژانە؛ رۆژینە؛ لە رۆژێکدا؛ ڕوێوەنە ‹روزانه پانصد تومان مزد مـی‌گرفـت: رۆژانـە پێنـسەد تمەن مزی دەگرت›.
**روزبخیـر** / rûzbexeyr/: [فارسـی/ عربـی] *دعـا.* رۆژباش؛ ڕیزوشەیێ کە دەکاتی رۆژدا بۆ چاک و خۆشی بەکار دەڕوا، بە واتای «هیـوادارم رۆژێکـی باشت هەبێ».
**روزپرواز** / rûzparvāz ، ـها؛ ـان/: *صفت.* رۆژفـڕ؛ رۆژگـەڕ؛ بـە واز و دانـستەی فـڕین دە رۆژدا ‹پرندەی روزپرواز: پەلەوەری رۆژفر›.
**روزشکار** / rûzšekār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* رۆژڕاو؛ بـە هۆگرەتی یـان تایبەتمەنـدی ڕاو و بژیـو پەیـدا کردن لە رۆژدا ‹جانور روزشکار: گیانەوەری رۆژڕاو›.
**روزشمار** / rûzšomār/: *اسم.* رۆژمێر؛ رۆژئەژمێر؛ رۆژژمێر؛ رۆژپێو؛ ئەوەی کە لە بارەی هەر یەکـە لە رۆژانی دیاریکراوی حەفتە، مانگ یـان ساڵـدا

ئاگاداریگەلێک دەدا.

**روزشماری** / rûzšomārî/: *اسم. [کنایی]* هەزارە؛ ڕۆژمێری؛ بۆ ڕوودانی ڕووداوێک ڕۆژ ژماردن ‹او برای آزادی برادرش روزشماری می‌کرد: بۆ ئازاد بوونی براکەی هەزارەی دەکرد›.

**روزکوری** / rûzkûrî/: *اسم.* ڕۆژکوێری؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی کەم بوونەوەی سۆمای چاو لە ڕووناکی زۆردا.

**روزگار** / rûz(e)gār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ڕۆزگار؛ ڕۆژگار؛ ڕۆزیار؛ سەردەم؛ سەروبەند: ١. زەمانە؛ دنیا؛ دەمان؛ دەور و زەمانە ‹روزگار پیری؛ در روزگار خانی: ڕۆژگاری پیری؛ لە سەردەمی خانیدا› ٢. *[مجازی]* دەوران؛ گەردوون؛ بار و دۆخ؛ حاڵ‌وهەوا؛ هەل‌ومەرج ‹روزگار ناموافق؛ گردش روزگار: ڕۆژگاری ناساز؛ سووڕی دەوران›.

◘ **روزگار گذراندن:** ڕۆژگار دانە سەر؛ ڕۆژگار تێپەڕاندن؛ ژین بە سەر بردن؛ تەمەن بەسەر دان؛ ڕۆژ بە سەر دان؛ قەرقەدانـدن؛ ڕۆژ قەتاندن؛ ژیان؛ ژیوەی.

**روزگرد**[1] / rûzgard ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ڕۆکێشک؛ سپاردەی کێشکی ڕۆژ؛ نواوانێ کە بە ڕۆژدا لە شوێنێک دەگەڕێ. بەرانبەر: **شب‌گرد**

**روزگرد**[2]: *صفت.* ڕۆژگەڕ؛ ڕۆگێڵ؛ بە چالاکی و گەڕان و جموجووڵ لە ڕۆژدا (لەمەڕ گیانەوەرانەوە).

**روزمرگی** / rûzmarregî/: *اسم.* هەرڕۆژەیی؛ بار یان چۆنیەتی هەموو ڕۆژە بوون.

**روزمره** / rûzmarre/: [فارسی/ عربی] *صفت.* هەرڕۆژە؛ هەمووڕۆژی: ١. پێوەندیدار بە کارگەلی ئاسایی ژیانی ڕۆژانەوە ٢. پێوەندیدار بە کار یان ڕووداوگەلی ئاسایی و هەر ڕۆژەییەوە.

**روزمزد** / rûzmozd/: *صفت.* ڕۆژمز؛ وەرگری مزی ڕۆژانە لە بەرانبەر کاری ڕۆژانەدا ‹کارگر روزمزد: کرێکاری ڕۆژمز›.

**روزن** / rowzan, ro:zan ، ـها/: *اسم. [مخفف، ادبی]* ڕۆژن؛ ڕۆچن؛ ڕۆژنە؛ کونی لە دیوار یان سەربان بۆ ڕووناکی و...

**روزنامجات** / rûznāmecāt/: (!) [فارسی/ از عربی] جمعِ ☜ **روزنامه**

**روزنامه** / rûznāme ، ـها؛ روزنامجات/: *اسم.* ١. ڕۆژنامە؛ ڕۆزنامە؛ غەزەتە؛ قەزاتە؛ بلاڤۆکی چاپی بە شێوەی پەڕە یان پەڕەگەلی بێ‌بەرگ و جزو بەند نەکراو کە زۆرتر لە کاتێکی دیاریکراوی ڕۆژانە یان حەفتانەدا بلاو دەبێتەوە و ناواخنی دەنگ و باسی ڕۆژ، بابەتگەلی ڕامیاری، کۆمەڵایەتی، هونەری و وەکوو ئەوانەیە ٢. *[قدیمی]* یادداشت یان گوزارشتی ڕۆژانە.

◘ **روزنامەی دیواری:** ڕۆژنامە دیواری؛ ڕۆژنامەی دیواری؛ نووسراوەیێ پتر دەس‌نووس، وەک ڕۆژنامە (واتە بریتی لە وتار و بابەتگەلی جۆراوجۆر) کە بۆ خوێندنەوەی خوێنەران لە سەر دیوارەوە دایدەکوتن ‹روزنامەی دیواری مدرسە: روزنامە دیواری قوتابخانە›.

**روزنامەخوان** / rznāmexān ، ـها/: *صفت.* ڕۆژنامەخوێن؛ هۆگرتوو بە خوێندنەوەی بلاڤۆکی گەروەگەرانە، بەتایبەت ڕۆژنامە. هەروەها: **روزنامەخوانی**

**روزنامەفروشی** / rûznāmefurûšî/: *اسم.* ڕۆژنامەفرۆشی: ١. کاری فرۆشتنی ڕۆژنامە ٢. *ـها/* شوێنێ کە ڕۆژنامەی لێ دەفرۆشن. هەروەها: **روزنامەفروش**

**روزنامەنگاری** / rûznāmenegārî/: *اسم.* ڕۆژنامەنووسی؛ ڕۆژنامەوانی: ١. کار و ڕەوتی نووسینی وتار لە ڕۆژنامەدا ٢. کار و ڕەوتی ڕێکوپێک کردن و چاپ و بلاوکردنەوەی ڕۆژنامە. هەروەها: **روزنامەنگار؛ روزنامەنویسی؛ رونامەنویس**

**روزنه** / rowzane, ro:zane ، ـها/: *اسم.* ڕۆچنە؛ ڕۆچن؛ ڕۆچینک؛ ڕۆچین؛ ڕۆژنە؛ ڕۆژەن؛

کولانچکــــه؛ کولانکـــه؛ کولانـــه؛ کوناوچـــه؛ کولاوڕۆژنە؛ کلاوڕۆژنە؛ تەشە؛ درز یان کونایەکی گچکە لە دیـوار یـان ڕوویەکـدا کـە دیـوی نـاو پێوەندیدەدا بە دیوی دەرەوە بۆ ڕووناکایی و...

روزه[1] / rûze/:اســـــم. ڕۆژوو؛ ڕۆژگ؛ ڕووژگ؛ ڕۆژی؛ ڕۆچیّ؛ کارێکی پەرستنی بە شێوەی خـۆ پاراستن لە خواردن و خواردنەوە و هەروەها برێ کــاریتــر، لـــە ڕۆژ، حەفتـــە یـــان مـــانگێکی دیاریکراودا.

▣ روزهی کنجشکی: ڕۆژووی بندۆڵە؛ ڕۆژگ تـا نیوەڕۆ.

▣ روزه خوردن: ڕۆژوو خواردن؛ ڕۆژوو نـەگرتن لە کاتی خۆیدا، یان شکاندنی.

روزه داشتن ☜ روزه بودن، **روزه**[2]

روزهی شکدار گرفتن: *[کنایی]* نەگەیشتنە ئاو قـول هەڵـکردن؛ ئـەنجام دانی کــارێ بـەبێ دڵــنیایی لــە ئاکــامی ‹اول ببـین آزاد ماشـین را میفروشد بعد برو برای خریدش پول قرض کـن! چرا روزهی شکدار مـیگـیری؟: لەبـەردا بزانـە ئـازاد ماشینەکە دەفرۆشێ، جا بچۆ پووڵی بۆ قەرز کـە! بۆ هێشتا نەکەیشتوویە ئاو قول هەڵدەکەی؟›.

روزه شکستن: ڕۆژوو شـکاندن؛ ڕۆچـێ/ ڕۆچـە مارەی؛ کۆتایی هێنان بە ڕۆژوو.

روزه گـرفتن: ڕۆژوو/ ڕۆژگ گـرتن؛ ڕۆچـێ/ ڕۆچە گیرتەی.

روزه گشودن: بەربانگ کردن؛ ڕۆژووکردنـەوە؛ ڕۆچەوەکەردەی؛ دەسپێکردنەوەی خـواردن لە کاتی خۆیدا.

**روزه**[2]: صفت. *[گفتاری]* بەڕۆژوو؛ ڕۆژوو؛ ڕۆژگەوان؛ ڕۆژووەوان؛ ڕۆچەوان ‹خـواهرم روزه اسـت: خوشـکم بەڕۆژووە›.

▣ روزه بـودن: بـەڕۆژوو بـوون؛ ڕۆژگ بـوون؛ ڕۆچێ/ ڕۆچە بیەی: **روزه داشتن**

ـــ **روزه**[3]: پیــوازه. ـــ ڕۆژە؛ ـــ ڕۆ؛ ـــ ڕوە: ١. پێوەندیدار بە مەودای کاتی بـە پێـی ڕۆژەوە ‹دەروزە: دەڕۆژە› ٢. ـــ ڕۆژان؛ بـەتەمـەن بـە گوێرەی ڕۆژ ‹نوزاد دوروزه: کۆرپەی دووڕۆژە›.

**روزەخـــواری** / rûzexārî/:اسـم. کـاری ڕۆژوو خـــواردن؛ ڕۆژوو نـــەگرتن؛ بـــەڕۆژوو نـــەبوون. هەروەها: **روزەخوار**

**روزەداری** / rûzedārî/:اســـم. ڕۆژگـــــەوانی؛ ڕۆچـــەوانی؛ بـــەڕۆژوویی؛ کـــاری ڕۆژووگـــرتن و بەجێهێنانی دابی ڕۆژوو. هەروەها: **روزەدار**

**روزەگشایی** / rûzegošāyî/:اسم. کاری بەربانگ کردنەوە؛ ڕۆچەوەکەردەی. هەروەها: **روزەگشا**

**روزی**[1] / rûzî/:اســـم. بژیـــو؛ داژیـــار؛ ڕۆزی: ١. پێخـــۆری ڕۆژانـــە ٢. ڕســـق؛ ڕزق؛ ئـــەوەی گیاندار لە ڕۆژدا بە دەسـتی دێنـێ ‹روزی را خـدا میرساند: بژیو لە خواوەیە›.

**روزی**[2]: قیـد. ڕۆژێ؛ ڕۆژێــک؛ ڕویـــو؛ ڕۆیێـــو؛ ڕوێوەنە: ١. ڕۆژانە؛ لـە هـەر ڕۆژدا ‹روزی هـشت سـاعت کـار مـیکـنیم: ڕۆژێ هەشـت سـەعات کـار دەکـــەین› ٢. شـــەو و ڕۆژێ؛ لـــە درێژایـــی شەوانەڕۆژدا ‹روزی چهار قرص مصرف شود: ڕۆژێـک چوار حوب بخورێ›.

**روزیرســـان** / rûzîresān/: صـفت. ڕۆزیدەر؛ بژیـــودەر؛ ڕۆزیگـــەیێن؛ دابینکـــەری داژیـــاری ڕۆژانەی کەسان.

**روژ** / roj, rûj ، ـها/: [فرانسوی]اسم. ماتیـک؛ ڕوژ؛ ماکێکی ڕەنگی بۆ ڕەنگ کردنی لێو: **رژ لب**

▣ روژ گونه: ماکێکی ڕەنگی بـە شـێوەی ئـارد یان هەویر بۆ جوانکردنی سەرگۆنا.

**روس** / rûs ، ـها/:اسم. ڕووس: ١. هەر یەکە لـە کەسانی سەر بە یەکێک لە هۆزەکـانی سـلاوی دانیشتووی ئورووپای ڕۆژهەلات کـە بـە زمـانی ڕووســـی قـــسە دەکـــەن ٢. هـــەر یـــەک لـــە دانیشتوانی خەڵکی ڕووسیا یان منداڵەکانیان.

**رؤسا** / ro'asā/: [عربی] جمعِ ☜ رَییس

**روساخت** / rûsāxt ، ـها/:اسم. ڕووچیـن؛ دیم؛ ڕووچن؛ هەر کام لە بنکە کۆمەڵایەتیەکان (وەک

بنەماڵە و دەوڵەت) کە پێشاندەری بار و دۆخی ئابووری، فەرهەنگی و ناوچەیی کۆمەڵگاییێکە.

**روسازی** / rûsāzî/: *اسم.* ڕووسازی؛ ڕووکاری؛ کاری چێ‌کردنی ڕووبەری دەرەوەی شتێ، بەتایبەت توێژی دەرەوەی بوراگە (جادە، شەقام، پیادەڕۆ).

**روسپی** / rûspî ، ـها؛ ـان/: *اسم. [ادبی]* سۆزانی؛ سۆزمانی؛ جندە؛ ژنی خۆفرۆش؛ ژنی داوێن‌تەڕ.

**روسپی‌خانە** / rûspîxāne ، ـها/: *اسم. [ادبی]* ماڵەجندە؛ قاحبەخانە؛ جندەخانە.

**روسپیگری** / rûspîgarî/: *اسم. [ادبی]* جنندەیی؛ جنەگەری؛ کار و ڕەوتی پارە بەدەس‌هێنان لە ڕێگای تێکەڵی کردن لەگەڵ پیاواندا.

**روستا** / rûstā ، ـها/: *اسم. [ادبی]* لادێ؛ دێ؛ لادەگا؛ دەگا؛ دێهات؛ لاگا؛ لاگە؛ ئاوایی؛ گوند.

**روستائی** / rûstā'î / ☜ **روستایی**

**روستازادە** / rûstāzāde ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* گوندی؛ دێهاتی: ۱. لە دایک‌بوو لە لادێدا ۲. تایبەتمەندی کەسێ کە دایک و بابی لادێیین.

**روستایار** / rûstāyār ، ـان/: *اسم.* دێیار؛ کەسێ کە کار و باری، یاری گەیاندن بە دێهاتە. هەروەها: **روستایاری**

**روستایی** / rûstāyî ، ـها؛ ـان/: *اسم.* لادێیی؛ گوندی؛ دێهاتی؛ پێوەندیدار بە لادێ یان سەر بەلادێیەوە ‹زندگی روستایی: ژینی لادێیی›: **روستائی**

**روسری** / rûsarî ، ـها/: *اسم.* سەرپۆش؛ ڕووسەری؛ دەوملی؛ جزیە؛ قوماشی سێ یان چوارگۆشە (زۆرتر بە شێوەی سێ‌سووچی مووچاوە) کە ژنان بە سەریدا دەدەن ‹روسری گلدار قشنگی سرش کرده بود: سەرپۆشێکی گوڵداری جوانی دابوو بە سەریدا›.

**روسفید** / rûsefîd, -sifîd/: *صفت. [مجازی]* ڕووسوور؛ ڕووچەرمگ؛ ڕووسپی؛ سەربەرز؛ کامەران لە جێبەجێ‌کردنی کاری پەسندا ‹او از امتحان روسفید بیرون آمد: لە ئەزموونەکەدا ڕووسوور دەرهات›.

**روسفیدی** / rûsefîdî, -sifîdî/: *اسم. [مجازی]* ڕووچەرمگی؛ ڕووسووری؛ سەربەرزی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕووچەرمگ بوون ‹او مایەی روسفیدی پدر و مادرش شد: بووە هۆی ڕووچەرمگی دایک و باوکی›.

**روسوفیل** / rûsofîl ، ـها/ : [؟] *صفت.* لاگری ڕووس: ۱. ڕووس‌پەرست؛ لایەنگری ڕووسان ۲. لایەنگری سیاسەتی دەوڵەتی ڕووسیە.

**روسی**[1] / rûsî/: *اسم.* ڕووسی؛ لە زمانە هیندو-ئورووپاییەکان، لقی سلاو کە ڕووسەکان قسەی پێ دەکەن.

**روسی**[2]: *اسم.* ڕووسی؛ سەر بە ڕووسیە یان هی ڕووسیە ‹سماور روسی: سەماوەری ڕووسی›.

**روسیاه** / rûsîyah ، ـان/: *صفت. [مجازی]* ڕووڕەش: ۱. ناوزڕاو؛ ڕووسیاو ‹این بچە ما را پیش مردم روسیاه کرد: ئەم منداڵە لای خەڵکیەوە ڕووڕەشی کردین› ۲. شەرمەزار؛ شەرمەسار؛ خەجاڵەت؛ خەجاڵەتبار ‹خدایا! این بندەی روسیاه خودت را ببخش: خوایە! لەم بەندەی ڕووڕەشەی خۆت خۆش ببە›.

**روسیاهی** / rûsîyahî/: *اسم. [مجازی]* ڕووڕەشی؛ شەرمەزاری؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕووڕەش بوون ‹زمستان می‌رود و روسیاهی بە زغال می‌ماند: زستان دەڕوا و ڕووڕەشی هەر بۆ خەڵووز دەمێنێتەوە›.

**روش** / raveš ، ـها/: *اسم.* ڕەوش؛ ڕەوشت؛ زێ: ۱. تەرز؛ چۆناوچۆنی جێبەجێ‌کردنی کارێک ‹روش انشا؛ روش آشپزی: ڕەوشی نووسین؛ تەرزی ئاشپەزی› ۲. ڕێ‌وڕەوش؛ چۆناوچۆنی ئاکار و شێوەی کەسێ لەمەڕ بابەتێکی دیاریکراوەوە ‹روش من این نیست کە با مردم دعوا کنم: ڕەوشی من وا نیە لەگەڵکدا بە شەڕ بێم›.

**روش‌شناسی** / raveš.šenasî/: *اسم.* ڕەوش‌ناسی؛ ڕەوشتناسی: ۱. کۆمەڵەیێک لە شێوە و

بنەماگەلی دەکارکراو لە ئامۆژەیەکدا (زانستی، فەلسەفی، هونەری و...) ٢. لێکدانەوە و لێڕوانینی بنەما و شێوەگەلی کەڵک لێ‌گیراو لە بوارێکی تایبەتدا.

**روشن** / rowšan, rošan/: *صفت.* رووناک؛ ڕۆشن؛ ڕەوشەن؛ رووشن؛ ڕوون: ١. خاوەنی رووناکی ‹اتاق روشن؛ روز روشن: دیوی روشن؛ ڕۆژی رووناک› ٢. داگیرساو؛ هەڵکراو؛ چاخ؛ خاوەنی رووناکایی یان گەرما ‹چراغ روشن؛ اجاق روشن: چرای روشن؛ وجاخی روشن› ٣. هەڵکراو؛ لە حاڵی داگیرسان یان کارکردندا (لەمەڕ دەزگاگەلی کارەبایی یان موتۆریەوە) ‹رادیو روشن است ولی صدایش درنمی‌آید: ڕادیوەکە روشنە، بەڵام دەنگی لێوە نایە› ٤. بە تیشکدانەوەی زۆرترەوە ‹رنگ روشن: ڕەنگی روشن› ٥. دیار؛ ئاشکرا؛ خویا؛ لەبار بۆ بە باشی و سانایی زانین، دیتن یان تێگەیشتن ‹روشن بود که نمی‌خواهد قبول کند: دیار بوو نایەوێ قبووڵی بکا› ٦. بە ئاگایی و بیرەوە ‹فکر روشن؛ ذهن روشن: بیری روشن؛ زەینی روشن›.

⊡ روشن کردن: ڕۆشن کردن: ١. داگیرساندن؛ هەڵگیرساندن؛ هەڵکردن؛ ڕۆناندن؛ ڕەوشاندن؛ گریسەنن؛ گیسەنە؛ گیسانن؛ ئەنەگیسنەی؛ گیسناینە؛ ئۆکردن؛ دەم داین؛ داگیرساندنی شتێک ‹اجاق را روشن کردم: وجاخەکەم روشن کرد› ٢. هەڵکردن؛ داگیرساندن؛ گریەنن؛ گیسناینە؛ وەگەڕ خستنی کارەبا لە خولگەیەکی کارەباییدا ‹تلویزیون را روشن کن!: تەلەڤیزیۆنەکە روشن کە!› ٣. هەڵکردنی موتۆرێک ‹موتور را روشن کرد: موتۆرەکەی روشن کرد› ٤. *[مجازی]* حاڵی کردن؛ تێ‌گەیاندن؛ ڕۆشن کردنەوە؛ ڕوون کردنەوە؛ بابەتێ بۆ کەسێک ڕوون کردنەوە ‹من درست نفهمیدم منظورت چیست، لطفاً مرا روشن کن!: باش نەمزانی مەبەستت چیە، تکایە حاڵیم کە!›. هەروەها: **روشن شدن**

**روشنائی** / rowšanā'î, ro:šanā'î/ ☜ **روشنایی**

**روشنایی** / rowšanāyî, ro:šanāyî/: *اسم.* ڕۆشنایی؛ ڕۆچنایی؛ رووناکایی؛ ڕۆژناهی؛ ڕۆژنایی؛ ڕوشناکی؛ ڕۆناهیاتی؛ ڕوونایی؛ ڕۆنکایی؛ رووناکی؛ سۆ؛ ڕەنک: ١. دۆخ یان چۆناوچۆنی ڕۆشن بوون ‹روشنایی اتاق کم است: روشنایی دیوەکە کەمە› ٢. نوور ‹از دور روشنایی ضعیفی به چشم می‌خورد: لە دوورەوە روشناییێکی کز دەبینرا› ٣. سەرچاوەی نوور و ڕۆشنایی * **روشنائی**

**روشن‌بین** / rowšanbîn, ro:šan-/ ـها؛ ـان/: *صفت. [مجازی]* ڕۆشن‌بین؛ بینا: ١. رووناک‌بین؛ خاوەنی بیری ورد و باش ٢. توانا لە تێگەیشتنی ئەنگێزە و سەرەنجامەکانی کار و ڕووداوگەلدا.

**روشندل** / rowšandel, ro:šan-/: *صفت. [مجازی]* ڕۆشندڵ؛ رووناکدڵ: ١. وریا؛ خاوەنی هۆشیاری و لێهاتوویی زەینی بۆ ئاگایی پەیدا کردن لەبارەی ڕووداوگەلەوە: **روشن‌ضمیر** ٢. ـان/ *[مجازی]* نابینا؛ کوێر؛ مجرۆ.

**روشن‌ضمیر** / rowšanzamîr, ro:šan-/: [فارسی/ عربی] ☜ **روشندل**

**روشنفکر** / rowšanfekr, ro:šan-/ ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت. [مجازی]* ڕۆشن‌بیر؛ رووناک‌بیر؛ تێگەیشتوو: ١. خاوەن بیر و ڕوانینێکی ئاگاهانە، دروست و دوور لە وشک‌مێشکی و ئەفسانە ٢. زانا بە دابی زەمان؛ تێگەیشتووی پێگەیشتوو؛ بڕوامەند بە دەور و نرخی زانست و فەرهەنگ لە بەرەو پێش بردنی کۆمەڵگادا.

**روشنفکری**[1] / rowšanfekrî, ro:šan-/: [فارسی/ عربی] *اسم. [مجازی]* ڕۆشنبیری؛ رووناکبیری؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕۆشنبیر بوون ‹سواد و تحصیلات به تنهایی نشانەی روشنفکری نیست: خوێندەواری و زانیاری بە تەنێ نیشانەی ڕۆشنبیری نیە›.

**روشنفکری**[2]: *صفت. [مجازی]* ڕۆشنبیری؛

ڕووناكبیری؛ ڕۆشنبیرانه؛ ڕووناكبیرانه؛ پێوەندیدار بە ڕووناكبیرانەوە ‹محفلهای روشنفكری؛ بحثهای روشنفكری: جڤاتگەلی ڕۆشنبیری؛ قسە و باسی ڕۆشنبیری›.

**روشنگری** / rowšangarî, ro:šan-/: /اسم. *[مجازی]* كار و ڕەوتی ئاگادار كردنەوەی خەڵكی لە چۆنیەتی كاران، بەتایبەت لەمەڕ دیاردەگەلی سروشتی و زانستی یان ڕووداوگەلی ڕامیاریەوە.

هەروەها: **روشنگر**

**روشنه** / rowšane, ro:šane، ـها/: /اسم. وڵەیار؛ شوێنی ئاوەڵا لە لێڕەواردا.

**روشنی** / rowšanî, ro:šanî/: /اسم. ڕۆشنی؛ ڕووناكی: ١. ڕۆهنی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕۆشن بوون ٢. ڕۆشنایی؛ ڕووناكایی.

**روشور** / rûšûr، ـها/: /اسم. *[گفتاری]* سپیاو؛ سپیاڤ؛ ماكی خاوێنكەرەوەی لەش.

**روشوفاژ**/ rûšûfāj, -šofāj، ـها/: [فارسی/ فرانسوی] /اسم. پۆشەنی ڕادیاتوری شووفاژ كە بە سەریدا دەدەن (بەتایبەت جابەیێكی چێوی كون‌ـكون): **روشوفاژی**

**روشوفاژی**/ rûšûfājî, -šofājî/: [فارسی/ فرانسوی] ☜ **روشوفاژ**

**روشویی** / rûšûyî، ـها/: /اسم. دەسشۆری؛ دەسشۆیی؛ دەسشۆ؛ دەسشۆرك.

**روضه** / rowze, ro:ze، ـها/: [عربی] /اسم. ١. ڕاز و چیرۆك لەمەڕ بەسەرهاتی پیاوچاكانی دینەوە كە جار و بار لەگەڵ شیعر و ئاوازی بەسۆز و گریاندایە ٢. كۆڕێ كە ئەم باسانەی تێدا دەبێژرێ ٣. *[ادبی]* باخ.

▣ **روضەی رضوان:** باخی بەهەشت؛ باخوو بەهەشتی.

**روضەخوان** / rowzexān, ro:ze-، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. *[شیعه]* كەسێك دە جل‌وبەرگی مەلاییدا كە كاری ڕەوزەخوێنی و لاواندنەوە و هێنانە گریانی خەڵكە.

**روضەخوانی** / rowzexānî, ro:ze-، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. ڕەوزەخوێنی: ١. كاری وتنەوەی ڕەوزە ٢. كۆڕێ كە تێدا ڕەوزە دەخوێنن.

**روغن** / rowqan, ro:qan، ـها/: /اسم. ڕۆن؛ ڕوون؛ دون؛ ڕوین؛ ڕوهن؛ ڕوەن؛ ڕۆغان: ١. هەر كام لە ماكگەلی چەور و تراو، نیوەتراو یان لیق كە تێكەڵی ئاو نابێ بەڵام تێكەڵی ئەلكول و ئیتر دەبێ و لە بان قوماش یان كاغەزەوە شوێنی دەمێنێتەوە ٢. بەرهەمێكی خواردەمەنی چەور، نەگۆڕ یان تراو كە لە چێشت دروستكردندا بەكار دێ ٣. مەڵهەم؛ دەرمانێك لە ماكگەلی چەورە كە دەیساونە شوێنی برین یان ئێشەوە ٤. هەر كام لە چەوریگەلی ڕەوانكەر كە لە پیشەسازیدا بۆ ڕەوانی و كەم كردنەوەی لێكگیران بەكار دێ و زۆرتر لە كانگاوە وەردەگیرێ ٥. هەر كام لە چەوریگەلی بریقەدەر.

▣ **روغن آراشید:** ڕۆنی بادامزەمینی.

**روغن استخوان:** ڕۆنی پێشە؛ ڕۆنێكی تۆخ و بۆگەنە كە لە ڕێگای بەتنۆكەكردن و وێڕای دارزانی ئێسك بەدەس‌دێ و سەرچاوەی پیریدینە.

**روغن اِسكاتیف:** ڕۆنی ئیسكاتیف؛ هەر یەكە لە ڕۆنگەلی گیایی (وەكوو ڕۆنی بەزرەك یان خورما) كە لە ڕەنگسازی و ڕەنگاریدا بۆ خێرا وشك كردنەوەی ڕەنگ بەكار دێ.

**روغن الیف:** ڕۆن ئەلیف؛ ڕۆنێكی سەنعەتی كە لە بەزرەكی دەگرن و لە ڕەنگكاری چێودا بەكار دێ.

**روغن بنگ:** ڕۆنی بەنگ؛ خواردەمەنیەكی هۆشبەرە كە بە كولاندنی چرۆی گوڵی شادانە لە ناو ڕۆنی بادام یان كەرەدا دروست دەبێ.

**روغن تونگ:** ڕۆنی تونگ؛ ڕۆنێ كە لە چێوی چینی دەیگرن.

روغن جلا: ڕۆنی جەلا؛ هەموو چەشنە ڕۆنێکی سەنعەتی کە بۆ بریقەدارکردنی رووکاری چێو بەکار دێ.

روغن چراغ: ڕۆنی چرا: ١. نەوت ٢. *[قدیمی]* ڕۆنی گەرچەک.

روغن حیوانی: ڕۆنی حەیوانی: ١. چەوری و بەزی نێو شانەگەلی گیانەوەران ٢. ☜ **روغن کرمانشاهی**

روغن خاکستری: ڕۆنی گورگی؛ ڕۆنێ کە ئوکسیدی جیوەی تێدایە و بۆ مەڵهەمی بڕێ وەرهەمی لەش بەکار دێ.

روغن خوراکی: ڕۆنی خۆراکی؛ ڕۆنێ کە بۆ خواردن بەکار دێ.

روغن دمیده: ڕۆنی پفدراو؛ ڕۆنێ کە بە هۆی پفدانەوە خەست بۆتەوە.

روغن زرد ☜ **روغن کرمانشاهی**

روغن کرمانشاهی: ڕۆنی کەرە؛ ڕۆن کوردی؛ ڕۆن خۆمانی؛ ڕوەنە وێمانە؛ چەشنێ ڕۆنی خۆراکی کە لە کولاندن و پالاوتنی کەرە بەدەس دێ و لە چێشتی دەکەن: **روغن حیوانی؛ روغن زرد**

روغن گیاهی: ڕۆنی گیایی؛ ڕۆنێ کە لە تۆم و گوڵی گیاگەل دەگیرێ.

روغن ماهی: ڕۆنی ماسی؛ ڕۆنێ کە لە جەرگی ماسی دەگرن و لە خواردن و دەرماندا کەڵکی لێ وەردەگرن.

روغن موتور: ڕۆنی موتور؛ ڕۆنێک لە بەرهەمگەلی نەوتی کە بۆ ڕەوانکردنی بەندەکانی موتور بەکاردەڕوا.

روغن نباتی: ڕۆنی نەواتی؛ ڕۆن ڕوەکی؛ ڕۆنێ کە لە تۆمگەلی گیای خۆراکیەوە دەگیردرێ.

▣ روغن زدن: ڕۆن لێدان؛ ڕوەن دەونەی.

روغن گرفتن: ڕۆن گرتن؛ ڕۆن کێشان؛ ڕۆن لێگرتن.

بی روغن سرخ کردن: *[کنایی]* بە وشکی سەر تاشین؛ لە کوولەکەی تەڕدا ئاور کردنەوە؛ زۆر فێڵەباز و ئاو ژێرکا بوون ‹مواظب باش! این از آنهاست که بی‌روغن سرخ می‌کند: هۆشت بێ! ئەمە لەوانەیە کە بە وشکی سەر دەتاشێ›.

**روغندان** / rowqandān, ro:qan ، ـها/: *اسم.* ڕۆندان؛ ڕووندان؛ دەفرێ بە لوولەیێکی باریک و درێژەوە کە ڕۆنی تێدەکەن و لە ڕۆنکاریدا بەکاردێ.

**روغن‌سوزی** / rowqansûzî, ro:qan/: *اسم.* ١. ڕۆن‌سووزی؛ کاری سووتانی ڕۆن لەگەڵ سووتەمەنی، بە هۆی گرفتی موتورەوە ٢. *[مجازی]* چۆنیەتی لاکەهاتن؛ زوان کەفتنە لای دەم؛ دەم بۆ گیلاخەخواردن چوون؛ تەکەی مل هاتن؛ بار و دۆخی هێز لەدەس‌دان و گیان تێدا نەمان ‹امروز دیگر از زور خستگی به روغن‌سوزی افتادم: ئەمرۆ ئیتر هێندە ماندووم لاکەم دێ›.

**روغن‌شکن** / rowqanšekan, ro:qan ، ـها/: *اسم.* چەوری‌بڕ؛ ڕۆن‌شکێن؛ ڕۆن‌بڕ؛ هەر شتێک کە ماکی چەوری لێک بکاتەوە.

**روغن‌فروش** / rowqanfurûš, ro:qan ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ڕۆن‌فرۆش؛ ڕوەن ورەش؛ بەتایبەت فرۆشیاری ڕۆنی کەرە.

**روغنکاری** / rowqankārî, ro:qan ، ـها/: *اسم.* ڕۆنکاری: ١. کار یا ڕەوتی پێدا ساوینی ڕۆن بۆ نەرم کردن یان بریقە پێ خستن ٢. کاری تێ‌کردنی ڕۆن بە جەمگە، خولگە، یاتاقان و پنتەگەلی لێکساوینی موتور و... بۆ ڕەوانکردنی جم‌وجووڵ لەنێوانیاندا؛ چەورکردنی مەکینە.

**روغن‌کشی** / rowqankešî, ro:qan-/: *اسم.* ڕۆن‌گری؛ ڕۆن‌گیری؛ کار یا ڕەوتی گرتنی ڕۆن لە تۆمگەلی ڕۆندار.

**روغنی**[1] / rowqanî, ro:qanî ، ـها/: *اسم.* *[گفتاری]* ڕۆنفرۆش.

**روغنی**[2]: *صفت.* ١. ڕۆندار؛ بەڕۆن ‹دانەی روغنی: تۆمی ڕۆندار› ٢. چەور؛ ڕۆناوی؛ ڕەونین ‹دستم

روغنی شد: دەسم چەور بوو›.

**روکار** [1] / rûkār ، ـها/: اسم. دیم؛ رووکار؛ ڕەپـن؛ ڕووی بنیا؛ نمای دەرەوەی ماڵ ‹ساختمانی بود با روکار سیمان سفید: ساختمانێک بـوو بـە دیمـی چیمەنتووی سپیەوە›.

**روکار** [2]: صفت. ڕووکار؛ لـە ڕووبـەری دەرەوە. بەرانبـەر: **توکار** ‹سیمکشی روکار: سیمکێشی رووکار›.

**روکش** / rûkeš ، ـها/: اسم. ١. دیمـە؛ چینکـۆ؛ چیمکۆ؛ ئەوەی بـۆ داپۆشـینی دیـوی دەرەوەی شتێ و پتر بۆ پاراسـتن یـا ڕازاندنـەوەی بـەکار دەڕوا ٢. [چاپ] ڕووکەش؛ ڕووکێش؛ بەرگێک کە زیاتر بۆ جوانی لە کتێبی دەگرن.

**روکم‌کنی** / rûkamkonî/: اسم. [گفتاری] لەڕووبـەری؛ کارەڕەهاتێـک بـۆ بـەرەنگاری لـە ڕووداری، بێ‌شەرمی یان نانەوە جێ خۆی کەس یان کەسانێک؛ کاڵ کردنەوە.

**روکوکو**/ rokoko/: [؟]اسم. ڕوکۆکۆ؛ شێوازێکی هونـەری کـە لـە سـەدەی ١٨ی زایینیـدا لـە ئورووپـای ڕۆژاوا لـە گـۆڕینی شـێوازی بـاروک بەدیهات و پتر لە بواری نژیارڤانی، نیگارکێشی و موسیقادا خۆی دەرخست.

**روگذر** / rûgozar ، ـها/: اسم. ڕووبوار؛ ڕووگوزەر؛ بوارگەیـەک (وەک پـرد یـان شـەقام) بـەرزتر لـە ڕووی زەوین، یان بە سەر بوارگەیەکی‌تردا.

**روگردان** / rûgardān/: صفت. [مجازی] ڕوو وەرگێڕ؛ خـاوەن بـار یـان چۆنیەتیـەک کـە لـە ویستنی شـتێ یـان جێبـەجێ‌کـردنی کارێـک چاوپۆشی بکا و ئیدی بە لای ئەو شتە یـان ئـەو کارەدا نەڕوا. هەروەها: **روگردان بودن؛ روگـردان شدن**

**روگردانی** / rûgardānî/: اسم. ڕووووەرگێڕی؛ کار یا ڕەوتی وازهێنان و چاوپۆشی کردن لـە شـتێ یان کارێک.

**رول** [1] / rol ، ـهـا/: [فرانسوی]اسم. ڕول؛ لـوول؛ لوولـە؛ تـۆپ؛ یەکـەی ژمـاردنی شـتێ کـە بـە شێوەی گرۆڤەر پێچراوەتەوە.

**رول** [2]: صفت. تۆپ؛ بە بەستەبەندی گرۆڤەریەوە.

**رول‌پلاک** / rolp(e)lāk ، ـها/: [از انگلیسی]اسم. ڕۆڵ‌پلاک؛ پێکهاتەیەکی پلاستیکی یان چێـوی هلۆڵ بۆ قایم‌کردنی پێچ لە پنتێکدا کە بە مەتـە کون کراوە.

**رولت** / rolet ، ـهـا/: [فرانسوی]اسم. ڕولێـت: ١. چەشـنێ شـیرینی خامـەیی ٢. چەشـنێک خواردەمەنی بە شێوەی بابۆڵە لە هەویری نـان، کـە پێخـۆری‌تـری لـە نێـو دەنـێن و سـووری دەکەنەوە ٣. چەشنێ ماشینی قومار ٤. [خیاطی] ئامێرێ بۆ گواستنەوەی نەخش و نیگار بۆ سـەر قوماش یان کاغەز.

**رولور** / rovelver ، ـها/: [انگلیسی]اسم. وەروەر؛ دەمانچەی تۆپی.

**روماتیسم** / romātîsm/: [فرانسوی] ☜ **رُماتیسم**

**رومال** / rûmāl/: اسم. ڕوومـاڵ؛ مـاکێکی لیـنج (وەک چەرمێنەی هێلکە) کە بەر لە برژاندنی نـان و شیرینی، بۆ خۆش‌ڕەنگ بوونـەوە بـە سـەریدا دەناون.

**رومان** / romān/: [فرانسوی] ☜ **رُمان**

**رومانتیسم** / romāntîsm/: [فرانسوی] ☜ **رُمانتی‌سیسم**

**رومانسک** / romānesk/: [؟] ☜ **رُومیایی ـ ١**

**رومیائی** / rûmiyā'î/: [؟] ☜ **رومیایی**

**رومیایی** / rûmiyāyî/: [؟]اسم. ڕوومیـایی: ١. شێوازێک لـە هونـەری نژیارڤـانی ئورووپـای ڕۆژاوا لـە نێـوان هونـەری ڕۆمـی و هونـەری گۆتیک، کە پـاش هـەزارەی یەکـەمی زایـینی، بەتایبەت بە شێوەی کەڵک وەرگـرتن لـە تـاقی کەمانی بەدیهات: **رومانسک** ٢. دەسـتەیێک لـە زمانگەلی هێندوـئورووپـایی کـە ڕیـشەیان لـە زمـانی لاتینیـەوە وەرگرتـووە (وەک: ئیتالیـایی، ڕۆمانیایی، فەرانسەوی، ئیسپانیایی، پورتەغالی و...)

*** رومیائی**

**رومیـــزی**[1] / rûmîzî ، ـــهـا/: اسم. روومیـــزی؛ چنراوێک له پارچه، مشەما یـان نـایلۆن کـه بـۆ داپۆشاندنی رووی دەرەوەی مێز بەکاردەڕوا.

**رومیـــزی**[2]: صـفت. روومێـــزی؛ بـــان‌مێـــزی؛ سەرمێزی؛ شیاو بۆ دانان له بـان مێـزەوه ‹چـراغ رومیزی؛ ساعت رومیزی: چرای روومیـزی؛ کـاتژمێری سەرمیزی›.

**روناس** / rûnās ، ـها/: اسم. سـۆرنگ؛ نووسـه‌ک؛ ڕۆنیاس؛ ڕوونیاس؛ گیایێکی ئالیکی بـه لاسـکی پۆشراو له زۆر دڕکی چکۆلـه و قـولاپی، گـه‌لای هێلکۆکـه‌یی گوڵـی بـه کۆمەڵـی زەرد و بـه‌ری سووری گۆشـتنەوە. لـه ڕەنگـی ڕیـشووی ئـه‌م گیایه له ڕەنگرێژیدا کەڵک وەردەگرن.

**روناسـی**[1] / rûnāsî/: اسم. روونیاسـی؛ ڕەنگـی سووری ئاماڵ‌زەرد. هەروەها: **روناسی‌رنگ**

**روناسی**[2]: صفت. روونیاسی؛ بـه ڕەنگـی سـووری ئاماڵ‌زەرد.

**رونـد** / ravand/: اسم. ڕەوت؛ ڕەوتانـه؛ ڕەوەن؛ چۆنیەتی گەڕانەیەک له باری بەرەوگە، خێرایـی یان ئۆگرەتیەوە.

**رونــد** / rond/: [فرانـسوی] صـفت. سەرڕاسـت؛ سەرڕاس؛ ڕێک.

▣ **رونـد کـردن**: ١. سەرڕاسـت کـردن؛ ڕێـک کردن ٢. [ریاضی] گردوکۆکردن.

**رونده** / ravande/: صفت. ڕەونده: ١. به توانایی یـان تایبەتمەنـدی بزوانـەوە ‹گیاه رونـده: گیـای ڕەونـده› ٢. ڕابگـار؛ ڕێبـوار؛ ڕاگـوزار؛ ڕاگـوزەر؛ ڕێڤنگ.

**رونـدی** / rûndî/: اسم. ڕۆنـدی؛ لـه زمانگـه‌لی بـانتو، زمـانی خەڵـکی ڕوانـدا و بروونـدی لـه ئەفریقای ڕۆژهەڵاتەوە: **کیروندی**

**رونـق** / rownaq, ro:naq/: [عربـی] اسم. بـرەو؛ پەرە ئەسـتێنی: ١. گەشـک؛ گەشـه؛ کـار یـان ڕەوتی پەرە سەندن ‹رونق شهرها؛ رونق کـشاورزی: پـەرەئەسـتێنی شـاران؛ گەشـکەی کـشتوکـاڵ› ٢. پێشڕەوت ‹بزودی کارش رونق گرفت: هـەر زوو کاری برەوی پەیداکرد› ٣. ڕەواج؛ ڕەمێن ‹رونق مد؛ رونق شهرنشینی: برەوی مۆد؛ ڕەواجـی شارنـشینی›. هەروەها: **رونق بخشیدن؛ رونق دادن؛ رونق گرفتن**

**رونمـا** / rûnemā ، ـهـا/: اسم. شەرمەشـکانه؛ سەرمەشقانه؛ سەرمەشقانی؛ دیارییەک کە پاش زەماوەند زاوا بۆ دیتنی بووک، پێی دەدا.

**رونوشت** / rûnevešt ، ـها/: اسم. ڕایش؛ لەبـەر نوسـراو؛ کـۆپی؛ ئـەوەی لـه رووی شـتێک نووسرابێتەوه: **المثنّى**

**رونویسی** / rûnevîsî/: اسم. روونووسـی؛ لەبـەر نووسـینەوە؛ لەبـەر خـەت گرتنـەوە؛ ڕەوەوە نویسەی؛ کار یان ڕەوتی فـەرکان؛ نووسـین لـه رووی دەقێک.

**روی** / ravîy(y)/: [عربـی] اسم. ڕەوی؛ دوایـین پـیتی سـەرەکی بەشـاوەند لـه هـۆنراوەی عەروزیـدا (وەکـوو پـیتی دال لـه «مـەرد» و «دەرد»دا).

**ـ روی** / ravî/: پیوازه. ـ ڕۆیی؛ ڕۆیین ‹پیادەروی: سوادەڕۆیی›.

**روی** / rûy/: اسم. ١. ڕۆح؛ تـوخمێکی کیمیـایی کانزایی به ژمارەی ئەتۆمی ٣٠ و کێشی ئـەتۆمی ٦٥,٣٧، کانزایـەکی تـورتی سـپی ئامـاڵ ئـاوی، ناتێکەڵاو له ئاو، تێکەڵاو لـه ئەسـید یـان بـازی داخدا کە لـه کانزاکـاری و دەرهێنـانی ئالیـاژدا بەکار دێ ٢. هەر یەکە له داهاتگەلی چێکراو له ڕۆح ٣. ـها/ [ادبی] روومەت؛ دەموچاو؛ چاڕ؛ ڕوە؛ دیمەن.

▣ **روی دادن**: قـەومان؛ ڕوودان؛ پـێش‌هـاتن؛ قۆمیەی ‹در ساختمان همسایه آتش سوزی شدیدی روی داد: لـه ماڵـه دراوسـێدا سـووتمانێکی دژوار قەوما›.

**رویا** / ro:yā, ro'yā ، ـها/: [عربـی] اسم. ١. خـەو؛ خەون؛ هۆن؛ هۆون؛ هـاون؛ هـەو؛ خـەوخـەون؛

دیمەن، ڕووداو، بیر و ئەندێشەگەلێ کە لە زەینی مرۆی خەوتوودا پەیدا دەبێ ٢. بیرۆکە و گومانگەلێ خۆش کە وەک دیمەنی ڕاستەقینە دێنە بەرچاو ٣. *[مجازی]* ئەوەی سەرسووڕێنەر دەنوێنێ.

**رویا** / rûyā/: *صفت.* بە توانایی ڕوانەوە.

**رویائی** / ro:yā'î, ro'yā'î/: [عربی] ☜ **رویایی**

**رویائی** / rûyā'î/ ☜ **رویایی**

**رویاروی** / rûyārûy/: *قید. [ادبی]* ڕووبەڕوو؛ ڕووەوڕوو؛ بەرەڕوو؛ بەرانبەر؛ وەرانوەر؛ لە هەمبەر یەکترەوە ‹دو حریف رویاروی یکدیگر قرار گرفتند: دوو غەنیم ڕووبەڕووی یەک وەستان›.

**رویارویی** / rûyārûyî/: *اسم.* ڕووبەڕوویی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی ڕووبەڕوو بوونەوە؛ لە ئاست یەکدا بوون؛ بەرامبەر یەک بوون؛ هەڵتەقین ‹هنگام رویارویی با چنین وضعی چه باید کرد؟: کاتی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئاوا دۆخێکدا دەبێ چبکەین؟› ٢. کار یان ڕەوتی کەوتنە هەمبەر یەکەوە؛ ڕووبەڕوو بوونەوە ‹ادامەی اختلاف سرانجام موجب رویارویی آنان شد و کار بە دعوا کشید: درێژەی ناکۆکیەکە ئاخری بووە هۆی ڕووبەڕوو بوونەوەیان و شەڕ قەوما›.

**رویان** / rûyān ، ـها/: *اسم.* ١. *[جانورشناسی]* تۆڵ؛ پـز؛ بوونەوەر، لە سەرەتاکانی گەشەکەییدا، بەتایبەت قۆناغی دەباڵدانی هێلکۆکەی باردار لە سەرەتای دەورەی ئاوسیدا ٢. *[گیاەشناسی]* گوە؛ بەشی ڕوەکی گیا لە تۆمدا کە بە هەڵکەوتنی بار و دۆخی شیاو، دەڕوێ و دەبێتە گیایێکی تازە.

**رویاندن** / rûyāndan/: *مصدر. متعدی.* // **رویاندی:** ڕواندت؛ **می رویانی:** دەڕوێنی؛ **برویان:** بڕوێنە// ڕواندن؛ ڕپاندن؛ سەوزکردن؛ شینکردن؛ پێگەیاندن؛ پنە یاونەی؛ بووز بۆ ڕوانی ڕوەک لواندن ‹رویاندن گلهای گلخانەای: ڕواندنی گوڵگەلی گوڵخانەیی›: **رویانیدن**. هەروەها: **رویاندنی**

■ صفت فاعلی: **رویاننده** (ڕوێنەر) / صفت مفعولی: **رویانده** (ڕوێنراو)/ مصدر منفی: **نَرویاندن** (نەڕواندن)

**رویان‌شناسی** / rûyānšenāsî/: *اسم.* تۆلناسی؛ پزناسی؛ لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەی گەشەی زینەوەر لە تۆم یان تۆمی باروەرکراوەوە.

**رویانی** / rûyānî/: *صفت.* تۆلی؛ پزی ‹مرحلەی رویانی: قۆناغی تۆلی›.

**رویانیدن** / rûyānîdan/ ☜ **رویاندن**

**رویایی** / ro:yāyî, ro'yāyî/: [عربی] *صفت.* خەیاڵی: ١. زۆر خۆش وەک خەیاڵی خۆش ٢. نەگونجاو؛ ناڕاست و خەیاڵاوی ٣. خەیاڵاوی؛ خەیاڵپەرست؛ هاوناییی؛ خاوەنی خوو یا هۆگری بە بیری خۆش، بەڵام نەگونجاو * **رؤیایی**

**رویایی** / rûyāyî/: *اسم.* دۆخ یان چۆنیەتی ڕوا بوون؛ بە توانایی ڕوانەوە: **رویائی**

**رویت** / ro:yāt, ro'yāt/: [عربی] *اسم. [ادبی]* دیدار؛ دیمانە؛ دیار.

⊡ رویت شدن: بینران؛ دیتران؛ پیویەی ‹هلال ماه نو رویت شد: کەمەی هەیڤی نوێ بینرا›.

رویت کردن: بینین؛ دیتن؛ دین؛ دیەی؛ دیای؛ وینەی؛ چاو پێ‌کەوتن ‹تنها یک بار آن را رویت کردم: تەنیا جارێ بینیم›.

**رویداد** / rûydād ، ـها/: *اسم.* ڕووداو؛ ڕوودای؛ دەگمە؛ پێکهات؛ پێشهات؛ بویەر؛ ئەوەی بەدیهاتووە یان ئەنجامدراوە ‹بیماری مادر برایش رویداد غم‌انگیزی بود: نەخۆشی دایکی ڕووداوێکی خەماوی بوو بۆی›.

**رویزیونیست** / revîzyonîst/: [فرانسوی] ☜ **تجدیدنظرطلب**

**رویزیونیسم** / revîzyonîsm/: [فرانسوی] ☜ **تجدیدنظرطلبی**

**رویش** / rûyeš/: *اسم.* کار یان ڕەوتی ڕوان؛ سەوز بوون؛ ڕسەی ‹نور خورشید و خاک خوب موجب رویش گیاهان می‌شود: تیشکی خۆر و خاکی چاک، دەبێتە هۆی ڕوانی گیا›.

**رویکرد** / rûykard ، ـها/: *اسم.* کاری سەرەتایی

بۆ گەیشتنە مەبەست.

**رویگر** / rûygar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* مسگەر؛ مزگەر؛ کەسێ کە دەفری مسی بە مالین سپی دەکاتەوە.

**رویگردان** / rûygardān/: *صفت. [مجازی، ادبی]* ڕووەرگێڕ؛ پشتتێکەر؛ پشتلێکەر؛ خۆپارێز.

**رویگردانی** / rûygardānî/: *اسم. [مجازی، ادبی]* ڕووەرگێڕی؛ خۆبوێری؛ خۆپارێزی.

**رویگری** / rûygarî ، ـها/: *اسم.* مسگەری؛ مزگەری؛ کار و ڕەوتی سپی کردنەوەی دەفری مسی بە پێدا مالین.

**رویه** / ravî(y)ye ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* شێوە؛ ڕێباز؛ تلۆج ‹اگر بە این رویە ادامە بدهی موجب ناراحتی دیگران خواهی شد: ئەگەر بەم شێوەیە بمێنیتەوە، دەبیە هۆی دلمەندی کەسانی‌تر›.

**رویه** / rûye ، ـها/: *اسم.* ڕوو؛ ڕواڵ: ١. ڕووکار؛ ڕووکێش؛ ئەوەی بە ڕووی شتێکیەوە دەدەن. بەرانبەر: **آستر** ٢. ڕووە؛ بەشی دەرەوەی هەر شتێک ٣. بانە؛ بەشێ لە کەوش کە سەرپەنجە دادەپۆشێ. بەرانبەر: **تخت/ زیره** ٤. *[ریاضی]* ئاست؛ سەتح.

**روی‌هم‌رفته** / rûyehamrafte/: *قید.* بەگشتی؛ بەسەر یەکەوە: ١. لەسەریەک؛ سەرجەم؛ تێکڕا؛ گردەوە ‹روی‌هم‌رفته صد هزار تومان خرج شد: لەسەریەک سەد هەزار تمەن خەرج کرا› ٢. پێکڕا؛ پێکەوە؛ بە لەبەرچاوگرتنی هەموو شتێک ‹روی‌هم‌رفته آدم خوبی است: بەگشتی، مرۆڤێکی باشە›.

**رویی**[1] / rûyî/: *صفت.* بانین؛ بانگین؛ سەرین؛ جێگرتوو لە ڕووەوە ‹کتاب رویی: کتێبی بانین›: **روئی**

**رویی**[2] / ـها/: ضمیر. بانین؛ سەرین؛ ئەوەی لە ڕووەوەیە ‹رویی بهتر است: بانیەکە باشترە›: **روئی**

**- رویی**[3]: *پیوازە.* - ڕوویی؛ خاوەن چۆنیەتیەک لە دەموچاودا بوون ‹خوشرویی: خوەشڕوویی›.

**روییدن** / rûyîdan/: *مصدر. لازم.* // **رویید:** ڕوای؛ **می رویی:** دەڕوێ؛ **بروی:** بڕوە // ڕوان؛ ڕپان؛ ڕسکان؛ ڕسەی؛ ڕسای؛ شین بوون؛ سەوز بوون؛ ڕەهستن: ١. چەکەرە دەرکردنی دان و سەرهەڵێنانی لاسک دە تۆی خاکدا ‹روییدن دانە: شین بوونی دانە› ٢. گەشە کردن و گەورە بوونی گیا ‹روییدن گل: ڕوانی گوڵ›: **رستن؛ روئیدن.** هەروەها: **روییدنی**

■ صفت فاعلی: **رویندە** (ـ)/ صفت مفعولی: **روییدە** (ڕواو)/ مصدر منفی: **نَروییدن** (نەڕوان)

**رویین تن** / rûyîntan/: *صفت. [مجازی]* گیان پۆلا؛ خاوەن لەشی وا کە هیچ چەکێک کاری تێ‌نەکا: **روئین‌تن**

**رە** / rah/: *اسم. [مخفف، ادبی]* ڕێ؛ ڕێگا؛ ڕا ‹رە چنان رو کە رهروان رفتند: بە ڕێدا وا بڕۆ ڕێبوارەکان چوون›.

**رها** / rahā/: *صفت. [ادبی]* ڕەها؛ ڕاهی: ١. دەرباز؛ دەرباس ٢. قوتار؛ قورتاڵ؛ ڕزگار؛ بەبێ سنوور و بەرهەڵست ٣. بەرەڵا؛ بەرهەڵدا؛ وێڵ؛ وڵ؛ بەبێ چاودێر و سەرپەرشت. هەروەها: **رها بودن؛ رها شدن؛ رها کردن؛ رها گشتن**

**رهائی** / rahā'î/ ☜ **رهایی**

**رهاندن** / rahāndan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **رهاندی:** ڤەڕساندت؛ **می رهانی:** دەڤەڕسێنی؛ **برهان:** بڤەڕسێنە// ڤەڕساندن؛ ڕزگارکردن؛ دەرباز کردن؛ نەفداندن: ١. ئازادکردن/ کرن/ کەردەی؛ بەردان؛ بەرهەڵداکردن ٢. ڕاپسکاندن؛ ڕاندن؛ ڕاپەڕاندن؛ نەجات دان؛ لە مەترسی پەڕاندنەوە

✻ **رهانیدن.** هەروەها: **رهاندنی**

■ صفت فاعلی: **رهاننده** (ڤەڕسێنەر)/ صفت مفعولی: **رهانده** (ڤەڕسێنراو)/ مصدر منفی: **نَرهاندن** (نەڤەڕساندن)

**رهانیدن** / rahānîdan/ ☜ **رهاندن**

**رهاورد** / rahāvard ، ـها/: *اسم.* دیاری؛ سەوقات؛ سۆقات؛ ئەوەی ڕێبوار و گەشتیار لەگەڵ خۆیدا

دەیهێنێتەوە.

**رهایی** / rahāyî/: *اسم.* ڕزگاری؛ ڕەهایی؛ ڕایی؛ دەربازی؛ بار یان دۆخی دەرباز بوون: **رهائی**

▣ **رهایی دادن/ بخشیدن:** ڕزگار کردن؛ ئازاد کردن.

**رهایی یافتن:** ڕزگار بوون؛ دەرباز بوون؛ بەر بوون.

**رهایی‌بخش** / rahāyîbaxš/: *صفت.* نەجاتدەر: ۱. ڕزگاریدەر؛ ڕزگارکەر ۲ دەربازکەر لە دیلی یان ڕەنج و ڕژدی.

**رهبان** / rohbān/: [عربی] ☜ **راهِب**

**رهبانیت** / rohbānîyyat/: [عربی]/*اسم.* تەرکەدنیایی؛ ڕەبەنایەتی: ۱. دنیا تاراوی؛ گۆشەگیری؛ دوورەخەڵکی؛ دوورەپەرێزی؛ کار یا ڕەوتی تاران لە ژیانی کۆمەڵایەتی و گۆشەنشینی و عیبادەت کردن بۆ بەخشرانی تاوان و نزیک‌بوونەوە لە خودا ۲. بار یان دۆخی تەرکەدنیا بوون.

**رهبر** / rahbar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ڕابەر؛ ڕێبەر؛ ڕەهبەر؛ پێشەوا: ۱. پێشەنگ؛ ئەو کەسەی ڕێ پێشان ئەدا و خەڵکی وە دووی دەکەون ۲. گەورەی گشت؛ کەسێ کە میللەت یان کۆمەڵێک ڕێبەری دەکا.

**رهبری** / rahbarî ، ـها/: *اسم.* ڕێبەری؛ ڕابەری: ۱. ڕێبەرایەتی؛ کاری ڕاپەڕاندن و بەڕێوە بردنی پۆل یان کۆمەڵێک لە ڕێگای گەیشتن بە ئارمانج و ئامانجگەلی دیاریکراو ۲. بەڕێبەرایەتی؛ بەڕێوەبەرایەتی؛ کۆڕ یان پێگەیێک کە ئەم کارانەی لە ئەستۆدایە.

**رهتوشه** / rahtûše ، ـها/: *اسم. [ادبی]* تۆشە؛ تۆشەڕا؛ بژیوی سەفەر.

**رهرو** / rahrow ، ـان/: *اسم. [ادبی]* ڕێبوار؛ ڕابگار؛ ڕێبار؛ ڕێڕەو؛ ڕەوندە؛ ڕەوەن؛ ڕێڤنگ؛ ڕێڤنگی؛ کەسێ کە بە ڕێگایەکدا یان بەرەو ئامانجێک بەڕێوەیە.

**رهسپار** / rahsepār ، ـان/: *صفت.* ڕوونیا؛ لە ڕۆشتندا؛ لە حاڵی چووندا: **راهسپار**

▣ **رهسپار شدن:** بەڕێ بوون؛ ڕۆشتن؛ کەوتنە ڕێ؛ ڕوونیای؛ ڕوونان؛ لوەی.

**رەشناس** / rahšenās ، ـان/: *صفت.* ڕێزان؛ ڕێناس؛ شارەزای ڕێ؛ خاوەن زانست و ناسین لەمەڕ ڕێوە.

**رهفرش** / rahfarš ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* ڕێپۆش؛ پۆشەنی ڕووکاری گوزەرگا و ڕێباز (وەک: ئیسفالت؛ سەنگکاری؛ موزاییک و...).

هەروەها: **رهفرش شدن؛ رهفرش کردن**

**رهگذر** / rahgozar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ڕێبوار؛ ڕابگار؛ ڕێبار؛ ڕێبگار؛ ڕێوار؛ ڕاویار؛ ڕێوبوار؛ ڕاگوزار؛ ڕاگوزەر؛ ڕێونگ؛ ڕەوەن؛ ڕێڤی؛ ڕێڤنگ؛ ڕێڤینگ؛ ئەوەی لە ڕێیەکدا دەڕوا ‹از رهگذری نشانی گرفتم: ناونیشانم لە ڕێبوارێک گرد›.

**رهن** / rahn/: [عربی]/*اسم.* گرەو؛ گرێو؛ بارمتە؛ بڕیارێ کە بە گوێرەی ئەوەوە، کەسێک لە بەرامبەر وەرگرتنی پارەیەک لە کەسێکی‌تر، ماڵێکی لە لا دادەنێ.

▣ **رهن دادن:** لە گرەو نان؛ لە گرێو نان؛ نانەگرەو.

**رهن کردن:** بە گرەوگرتن؛ گرتنە گرێو.

**از رهن درآوردن:** لە گرێو دەرهێنان؛ بێبرەو کردنی بڕیارنامەی گرەو.

**رهنما** / rahnemā/ ☜ **راهنما**

**رهنمایی** / rahnemāyî/ ☜ **راهنمایی**

**رهنمود** / rahnemûd, rahnomûd, rahnamûd، ـها/: *اسم.* ڕێنوێنە؛ وتار یان نووسراوەیێک بۆ ڕێنوێنی کەس یان کەسانی دی.

**رهنمون** / rahnemûn, rahnomûn, rahnamûn/: *اسم.* ڕێنوێن؛ ڕێشاندەر؛ ڕێنما؛ ڕانما؛ کەسێ کە ڕێ شان دەدات.

▣ **رهنمون شدن:** ڕێ نیشاندان؛ ڕێ شاندان؛ ڕێنواندن؛ ڕا نیشان دەی/ دای.

**رهن‌نامه** / rahn.nāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. گرەونامە؛ نووسراوەیێ کە تێیدا گرەونانی مـڵـک و بـایی، مـاوە، مەرجگـەل و نـاوی گرەونـەر و گرەوگر نووسراوە.

**رهنورد** / rahnavard ، ـان/:اسم. [ادبی] رێپێـو؛ رێبوار؛ ئەوەی رێ دەپێوێ.

**رهنی** / rahnî/: [عربی] صفت. بارمتەیی؛ گرەوی: ١. پێوەندیدار بە گرەووەوە ٢. لە گرەودا بوو.

**رهوار** / rahvār/ ☜ **راهوار**

**رهیافـت** / rahyāft/:اسم. رێـدۆز: ١. قۆنـاخی سەرەتایی لە رێ گەیشتن بە ئامانجدا ٢. کارێ کە بۆ گەیشتن بەم قۆناخە دەکرێ.

**رهیدن** / rahîdan/: مصدر. لازم. [ادبی] // **رهیدی:** ڤەرِسیت؛ **می‌رهـی:** دەڤەرِسـی؛ **رهاشـو:** بـڤەرِسە// ڤەرِسین؛ ڤەرِسان؛ قەوتان؛ رەسـتەی؛ نەفـدین؛ رەسین؛ راپسکان؛ ئازاد بوون؛ رەها بیەی: ١. لە بەند بەر بوون ٢. رزگار بوون؛ خەلستن؛ فلـتین؛ لە سەختی، دژواری یان گرفت دەرباز بوون.

■ صفت مفعولی: **رهیـده** (ڤەرِسـیو)/ مـصدر منفـی: **نَرهیدن** (نەڤەرِسین)

**رهین** / rahîn/: [عربی]/اسم. [ادبی] بارمتە؛ ئەوەی لە گرەوی دیترانە.

⊡ رهـین منّـت کـسی بـودن: لـە ژێـر منـەت کەسێکدا بوون؛ لە بەر یارمەتی و چاکـەکاری کەسێک، منەتباری بوون.

**ری** / rey/: [از عربـی]/اسـم. ١. رەی؛ یەکـەی کێشی خۆماڵی بەرامبەر١٢ کیلۆگرەم ٢. پیـت؛ پیتـە؛ کـێش؛ دۆخ یـا چۆنـاوچۆنی زۆرکـردنی بارستایی شتێک ‹برنج خوبی بود و هر استکان، نـیم اسـتکان ری مـی‌کـرد: برنجێکـی بـاش بـوو، هـەر پیاڵـەیەک نیـوپیاڵـە پیتـی دەدایـەوە›: **ریـع** ٣. پەلـەوەرێک لـە راسـتەی وشـترمران بـە جەسـتەیەکی مامناوەنـدی، پـەڕی نـەمتر لـە وشترمر، سێ ئەنگووس بە جیێ دووئـەنگووس و دووچکەی بێ‌پەڕەوە: **شترمرغ آمریکایی**

**ریا** / riyā/: [عربی]/اسم. چـاوە؛ ڕووبـینی؛ ڕیـا؛ دووڕوویی؛ ڕوا؛ ڕواڵەت؛ ڕەوتاری لـەبار و شـیاوی درۆینە بۆ لاباندنی کەسانی‌تر.

**ریائی** / riyā'î/: [عربی] ☜ **ریایی**

**ریاحین** / rayāhîn, riyāhîn/: [عربی]/اسم. [ادبی] گوڵان؛ گوڵێ؛ گوڵگەل؛ گوڵیەل.

**ریاسـت** / riyāsat/: [عربـی]/اسم. سـەرۆکایەتی؛ سـالاری؛ سـەرداری؛ ڕەئیـسی؛ سـەرۆکی: ١. پیشە یـان پلـەی سـەرۆک ‹ریاسـت دانـشگاه: سـەروکایەتی زانـستگا› ٢. بـار یـان چۆنـاوچۆنی سەرۆک بوون ‹از ریاسـت فقـط افـاده‌اش را دارد: لـە سـەرۆکی گەوەزەییەکـەی هەیـە و بـەس›. هەروەها: **ریاست کردن**

**ریاست‌طلب** / riyāsat.talab ، ـها؛ ـان/: [عربـی] صـفت. ئاغـاییخـواز؛ هـۆگر و خوازیـاری سـەرۆکایەتی و گـەورەیی کـردن. هـەروەها: **ریاست‌طلبی**

**ریاضت** / riyāzat ، ـها/: [عربـی]/اسم. کەزلاتـەی؛ ریازەت؛ سەختی؛ ئەرک و ڕەنجێ کە کەسێ بۆ ڕاهێنانی ڕۆح و ڕام کردنی نەفسی خـۆی ڕجـوا ئەبینێ.

**ریاضت‌پیشه** / riyāzatpîše ، ـها؛ ـگـان/: [عربـی/ فارسی] صفت. ریازەت‌پیشە؛ خـاوەن هـۆگرەتی و خووی سەختی کێشان.

**ریاضت‌کش** / riyāzatkeš/: [عربی/ فارسی] صفت. ریازەت‌کێش؛ هەڵگری ڕەنج و سەختی.

**ریاضی**[1] / riyāzî ، ـات/: [عربـی]/اسم. بیرکـاری؛ ریازیات؛ ریازی.

**ریاضی**[2]: صفت. بیرکاری؛ ریازی؛ پێوەندیدار بـە ریازیاتەوە.

**ریاضیات** / riyāziyāt/:اسم. ریازیـات؛ زانـستی کردەوە، پەیوەندی و پێکهاتەگـەلی پێوەندیـدار بە چەندیەتگەل و ڕەقەم و ئەندازەگیری.

**ریاضـیدان** / riyāziydān ، ـهـا؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی]/اسم. بیرکـار؛ ریازیـدان؛ پـسپۆڕ یـان

زانستمەندی ڕیازی.

**ریاکار** / riyākār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. ڕیاباز؛ ڕووبین؛ دووڕوو؛ ڕواباز؛ ڕیایی کەر؛ ڕواڵەتباز؛ ڕیاکار؛ ڕووباز؛ قسەمێچکە؛ مەرایی کەر؛ دووزوان؛ ئەوەی بە درۆ خۆی پارێزیار، چاکەکار و بەبەزەیی نیشان دەدا. هەروەها: **ریاکاری**

**ریال** / riyāl ، ـها/: [از اسپانیایی]/اسم. ڕیاڵ؛ قەران؛ قران؛ یەکەی پارەی ئێران و عەرەبستان و چەند وڵاتی‌تر.

**ریایی** / riyāyî/: [عربی] صفت. [ادبی] ڕیاباز: **ریائی**

**ریب** / reyb, rîb/: [عربی]/اسم. [ادبی] ۱. شک؛ شکە؛ ڕوێز؛ گومان ۲. دڵپیسی؛ دوودڵی ۳. دووڕوویی؛ ڕیابازی.

**ریبوفلاوین** / rîbof(e)lāvîn/: [فرانسوی]/اسم. ویتامین ب۲ ☜ **ویتامین**

**ریتم** / rîtm ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ڕیتم: ۱. کێشی مۆسیقا؛ کوتاهەنگ ۲. شێوەی وتن؛ ئاهەنگ.

**ریتمیک** / rîtmîk/: [فرانسوی] صفت. ڕیتمیک؛ ئاهەنگی: ۱. زەربی؛ لێدانی؛ کوتانی ۲. ئاهەنگین.

**ریتین** / rîyateyn/: [عربی]/اسم. سیگەل؛ هەردووسی.

**ریحان** / reyhān/: [عربی]/اسم. ۱. ☜ **ریحانی** ۲. /ـها/ ڕێحانە؛ ڕێحان؛ ڕحان؛ ڕیان؛ ڕیوون؛ ڕێون؛ گیایەکی ئاڵفی یەکساڵەیە، بە گەڵای هێلکەیی و نووسکن بەرانبەر بە یەک و لێوار و دانەدار کە بۆن و تامێکی خۆشی هەیە و بۆ سەوزی خواردن بەکار دێ: **بادروج؛ بادروگ**

**ریحانی** / reyhānî/: [عربی]/اسم. لە خەتگەلی عەرەبی و فارسی کە پتر لە نووسینەوەی قورئاندا بەکار دێ: **ریحان ـ ۱**

**ریخت** / rîxt/:/اسم. ۱. بیچم؛ ڕواڵەت؛ تووز؛ سوێس؛ پێکهاتەی دەرەوە ‹خانەشان ریخت خانەهای دهاتی را داشت: ماڵەکەیان بیچمی ماڵە لادێییەکان بوو› ۲. دیامان؛ بیچم؛ تەشک؛ فەسال؛ ئەژم؛ دیدار؛ سەکوت؛ سەکوم؛ کەسم؛ سەروسیما؛ ڕەخت؛ سەر و قلخ؛ سەر و سەکوت؛ ڕێخت؛ ڕێت؛ قەلافەت؛ شکڵ و پێکهاتەی گیاندارێک یان هەر یەکە لە ئەندامانی ‹بدریخت: بەودیامان› ۳. [زمین‌شناسی] ڕێژمانی دەرەوەی بەردگەل لەلایەن زەوین‌ناسیەوە ٤. ڕیت؛ کار یان ڕەوتی ڕژان؛ ڕژاندن ‹ریخت و پاش: ڕژان و پژان›.

▣ **ریخت کسی/ چیزی بودن:** لە کەسێ/ شتێ چوون؛ لە کەسێ/ شتێک کردن؛ وەک کەسێ/ شتێک بوون؛ ئەوە یۆی/ چێوێوی شیەی ‹سر و وضعش ریخت بازاریها بود: سەر و سەکوتی لە بازاری دەچوو›.

**از ریخت افتادن:** [مجازی] لە تەشک کەوتن؛ بیچم و حاڵەتی خۆ لە دەس‌دان. هەروەها: **از ریخت انداختن**

**به ریخت کسی/ چیزی در آوردن:** [مجازی] خۆ وەکوو کەسێ/ شتێ پێکردن؛ بە ڕەنگی کەسێ یان شتێ دەرهێنان ‹با این لباس خودت را به ریخت گداها درآورده‌ای: بەم گنجەت خۆت وەکوو سواڵکەر پێ کردووە›.

**ریخت‌شناسی** / rîxtšenāsî/:/اسم. بیچم‌ناسی: ۱. لقێک لە ژین‌ناسی کە لەمەڕ نژم و پێکهاتەی ڕووەک و جانەوەرانەوەیە ۲. لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی پێکهاتەی وشەگەل لە زمانێکدا؛ **مُرفولژی**

**ریختگری** / rîxtgarî/ ☜ **ریخته‌گری**

**ریختن** / rîxtan/: مصدر. لازم. متعدی. // **ریختی:** ڕژاندت؛ **می ریزی:** دەڕژێنی؛ **بریز:** بڕژێنە// ▫لازم. ۱. ڕژان؛ ڕێژان؛ ڕژیان؛ ڕشیان؛ مجیەی؛ بەر بوونەوەی تراو، دەنک یان ئەندامگەلی کۆمایەک، لە بەرزاییەوە بۆ خوار ‹سماور برگشت و آبجوش ریخت روی پایم: سەماوەرەکە داریایەوە و

ئاوەکوڵەکە رژا به سەر پامدا› ۲. تکان؛ وەرین؛ لە ناو چوون ‹آبروی کسی ریختن: ئاوڕووی کەسێک تکان› □ *متعدی*. ۳. داڕژاندن؛ ئەرەمتەی؛ بە شێوەی نێو قاڵب دەرێنان ‹مجسمه ریختن: کوتەڵ ڕژاندن› ٤. ڕژاندن؛ ڕێوی کرن؛ ڤەڕێتن؛ ڕشتن؛ متەی؛ ڕیتن؛ ڕیهتن؛ ڕهتن؛ ڕژتن؛ بەر دانەوەی تراو، دەنک یان ئەندامگەلی کۆمایەک لە بەرزاییەکەوە بۆ خوار ‹خاک را ریخت توی باغچە: خۆڵەکەی ڕژاندە نێو باخچەکەوە› ٥. *[مجازی]* ڕژاندن؛ تکاندن؛ بردن؛ لەناو بردن ‹آبروی کسی را ریختن: ئابڕووی کەسێک تکاندن› ٦. ڕژاندن؛ داخستن؛ پاشین؛ پژاندن؛ بڵاو کردنەوە یان وەشاندنی شتێک ‹دانە ریختن: دانە ڕژاندن› ۷. *[بانک]* ڕژاندن؛ خستنە حەساو ‹پول به حساب کسی ریختن: پارە ڕژاندنە حەساب کەسێکەوە›.
هەروەها: **ریختنی**

■ صفت فاعلی: **ریزنده** (ڕژێنەر)/ صفت مفعولی: **ریخته** (ڕژاو)/ مصدر منفی: **نَریختن** (نەڕژاندن)

⊡ **به هم ریختن** ☜ **هم**[1]

**روی هم ریختن** ☜ **رو**[2]

**ریخت و پاش** / rîxt-o-pāš/: *اسم*. کار یان ڕەوتی ڕژاندن و پژاندن؛ ڕژان و پژان: *الف)* تێکەڵ ــ پێکەڵی *ب) [مجازی]* هەڵەخەرجی؛ تەخشان-پەخشان؛ کار یان ڕەوتی هەرشاندن ‹اگر بخواهیم ریخت‌وپاش کنیم، کارمان به ورشکستگی می‌کشد: گەر بمانەوێ هەڵەخەرجی بکەین، تێدەشکێین›.

**ریختەگری** / rîxtegarî/: *اسم*. ۱. پیشەی ڕێختمانکار ۲. ڕێختمانکاری؛ کاری دارشتنی کانزا ۳. ـها/ کارگەیەک کە ئەم کارەی تێدا دەکرێ: **ریختگری**. هەروەها: **ریختەگر**

**ریدمان** / rîdemān/: *اسم. [مستهجن]* ۱. کاری ڕیان؛ گوو کردن ‹بچه مشغول ریدمان است ببرید پاکش کنید!: منداڵەکە خەریک ڕیانە، ببەن پاکی کەنەوە› ۲. *[مجازی]* گووکاری؛ کردنی کارێک بە خراپترین شێوە و تێکدانی بار و دۆخ ‹تو هم که با آن ریدمان آبروی ما را بُردی: تۆش بەم گووکاریەت ئابڕوومانت برد›.

**ریدن** / rîdan/: *مصدر. لازم. [مستهجن]* // **ریدی**: ڕیای؛ **می‌رینی**: دەڕێی؛ **بِرین**: بڕێ(نە)// ڕیان؛ ڕیتن؛ ڕین؛ گوو کردن. هەروەها: **ریدنی**

■ صفت مفعولی: **ریده** (ڕیاو)/ مصدر منفی: **نَریدن** (نەڕیان)

**ریز**[1] / rîz/: *اسم*. ڕیز؛ پێڕستی پاژگەلی کۆمەڵەیەک ‹ریز اسامی: ڕیزی ناوگەل›.

**ریز**[2] / ـها/: *صفت*. ورد؛ وردیلە؛ وردەڵە؛ چکۆلە؛ هیر؛ هوویر؛ هیرد؛ هوور؛ هۆرد؛ هێت؛ هرووشە؛ گەردیلە؛ خونگە؛ خورد؛ خوچۆک؛ پراش؛ خاش؛ ژیلە؛ زیل؛ ڕێز؛ سیرەئەنجن؛ سیرەنجن؛ گردەڵ؛ بووچکەلە؛ بیچکەلە ‹ماهی ریز: ماسی ورد›.

**ـ ریز**[3]: *پیواژە*. ۱. ـــ ڕێز؛ ـ ڕێژ؛ ـ وەر؛ بڕژێن ‹گلریز: گوڵڕێز؛ خونریز: خوێنڕێژ› ۲. ـــ ڕژاو؛ ـ ڕێژاو؛ ـ ڕژیاگ ‹دورریز: دوور ڕژاو›.

**ریزاب** / rîzāb/: *اسم*. ڕێژاو؛ ئاوی وەرگیراو بۆ گەڕانەیەک. بەرانبەر: **دراب**

**ریزابە** / rîzābe ، ـها/: *اسم*. ڕێژاوە؛ ئاوێ کە دەرژێتە نێو کۆماییکی ئاوەوە (وەک گۆم، چەم یان ئەستێرک).

**ـــ ریزان** / rîzān/: *پیواژە*. ـــ ڕێزان؛ ـــ ڕزان؛ ـ وەران؛ ـ ڕێژ؛ لە حاڵی وەریندا ‹برگ‌ریزان: گەڵاریزان›.

**ریزبافت** / rîzbāft ، ـها/: *صفت*. وردچن؛ تەنزیل؛ بە تانوپۆی لێک نزیکەوە ‹قالی ریزبافت: قاڵی وردچن›.

**ریزبر** / rîzbor ، ـها/: *اسم*. ناسکبڕ؛ ئامێرێ بۆ بڕینی پەڕەگەلی زۆر ناسک: **میکرۆتۆم**

**ریزبین** / rîzbîn ، ـها/: *اسم*. هووربین؛ وردبین: **میکروسکوپ**

**ریزسنج** / rî(z)sanc ، ـها/: *اسم*. وردپێو؛ ڕێزپێو؛ میکرومیتر.

**ریزش** / rîzeš/: *اسم.* ۱. کار یان ڕەوتی ڕژان؛ وەرین؛ داباریـن ‹ریزش آب: ڕژانی ئـاو› ۲. /ـها/ بارشت؛ ئەوەی بە شێوەی بـەفر، بـاران، تـەرزە و... لە ئاسمانەوە دەبارێ.

**ریزفیلم** / rîzfîlm ، ـها/: [فارسی/ فرانسوی]*اسم.* میکرۆفیلم؛ وردفیلم؛ فیلمی نووسراوەییێکی چاپی یان وێنەییێک لە ئەندازەی زۆر وردیلەدا.

**ریزموج** / rîzmowc, -mo:c ، ـها/: [فارسی/ عربی]*اسم.* وردپێل؛ وردەپێل؛ کەل.

**ریزنقش** / rîznaqš ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[مجازی]* ژیکەلە؛ خاوەن ئەندامگەل و ڕوالەتی ورد و ڕواڵ ‹یک جوان ریزنقش سخنرانی کرد: لاوێکی ژیکەلە قسەی کرد›.

**ریزوئید** / rîzo'zîd ، ـها/: [فرانسوی]*اسم.* *[گیاەشناسی]* ڕیشاڵ؛ ڕیشۆڵە؛ وردە و پەردەی بەن‌ئاسا لەجێ ڕیشە لە برێ ڕوەکدا.

**ریزه**[1] / rîze ، ـها/: *اسم.* وردە؛ ورتکە؛ پرتکە؛ پرتک؛ پرت؛ پراش؛ کەمووکە؛ کەمووسکە؛ هیردە؛ هیرە؛ ئەنجە؛ پارچەییێکی بچووک و باریک لە شتێک ‹ریزەی نان: وردەی نان›.

**ریزه**[2]: *صفت.* *[گفتاری]* ڕیزە: ۱. /ـها/ تۆزقاڵ؛ وردیلە؛ ژیلە؛ چووکە؛ بە بارستایی یان بیچمێ بچووکەوە ۲. کەمووسکە؛ زۆرکەم ‹اگر یک ریزە همت داشتی، این‌طور نمی‌شد: ئەگەر تۆزقالێک هیمەتت هەبوایە، ئاوا نەدەبوو›.

**ریزه‌خوار** / rîzexār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* وردەخۆر؛ پاشخوان‌خۆر؛ ڕێزەخۆر؛ بە خوو و هۆگرەتی ڕێزەخۆریەوە.

**ریزه‌خواری** / rîzexārî ، ـها/: *اسم.* پاشخوان‌خۆری؛ وردەخۆری؛ کار یان ڕەوتی دابین‌کردنی زەوا لە پاشماوەی پێخۆر و زەوای کەسانی‌تر.

**ریزه‌خوانی** / rîzexānî ، ـها/: *اسم.* ۱. *[مجازی]* پرتەوبۆلە؛ ویزەویز ۲. کار و ڕەوتی بە گوێدا دانەوە؛ ئامادەکردنی کەسێک بۆ پەزیرانی داخوازیەک لە ڕێی وتنەوەی پەیتا ـ پەیتا و یەک لە سەر یەکی قسەگەلێکەوە ‹آن‌قدر ریزەخوانی کرد تا قبول کردم: هێندەی بە گوێدا دامەوە تا بەرایيم دا›.

**ریزه‌کاری** / rîzekārî ، ـها/: *اسم.* وردەکاری؛ ڕێزەکاری: ۱. پاژگەلی ورد و جێ تێڕامانی شتێک ۲. کاری ڕێز و ورد، بەتایبەت کاری هونەری کە ئاوا تایبەتمەندیەکی هەبێ.

**ریزی**[1] / rîzî/: *اسم.* وردی؛ وردیلەیی؛ بار یان چۆناوچۆنی ورد بوون ‹سیب به این ریزی و به این گرانی؟!: سێوی بەو وردیە، هێندە گران؟!›.

**ـ ریزی**[2]: *پیوازە.* ـ ڕێژی؛ ڕشتن ‹خونریزی: خوێنڕێژی›.

**ـ ریس** / rîs/: *پیوازە.* ـ ڕێس؛ بڕیس؛ ڕێسەر ‹پشم‌ریس: خوری‌ریس›.

**ریسک** / rîsk ، ـها/: [فرانسوی از ایتالیایی]*اسم.* بڤ؛ مەترسی؛ جەربەزەیی؛ دوبەختی؛ دەبێ یان نابێ؛ مل نان بە کارێکەوە کە ئاکامی نادیارە.

▣ **ریسک کردن:** کاری بڤە/ دووبەختی کردن ‹ولی من مجبورم ریسک بکنم، بلکه از این وضع نجات یابم: بەلام من ناچارم بڤە بکەم، بەلکوو لەم دۆخە دەرچم›.

**ریسمان** / rîsmān ، ـها/: *اسم.* گوریس؛ گورێس؛ قەریس؛ وەریس؛ وەریسک؛ وەرێسە؛ سێتا؛ سێتە؛ فرێت؛ پەت؛ چەلە؛ چەلا؛ جلە؛ هەبی؛ کڕ؛ دوژ؛ کندڕ؛ چنراوی درێژی چەند تالی لە هەودای بادراو بە یەکەوە، بۆ بەستنەوە یا هەلخستنی شتێک لە سەری.

▣ **با ریسمان کسی به ته چاه رفتن:** *[کنایی]* بە گوریسی کەسێک خۆ خستنە چاوە؛ بە پشتیوانی و هاندانی کەسێکەوە کارێکی بڤە کردن.

**ریسندگی** / rîsandegî/: *اسم.* ۱. کاری ڕێستن ۲. /ـها/ کارگەیێک کە بەنی تێدا دەڕێسن.

**ریسه** / rîse ، ـها/: *اسم.* ریسە؛ ڕستە؛ ڕیز؛ ڕست؛

تاڵ؛ گشته‌ک.

◘ ریسه رفتن: قڵ کردن؛ سۆس جوین؛ تریقانه‌وه؛ حلیکانه‌وه؛ ئه‌وه قلیه‌ی؛ خه‌ش کردن.

ریسه شدن: قه‌تار به‌ستن؛ قه‌تار بوون؛ ڕیز بوون؛ ڕز به‌ستن؛ ڕیز به‌ستن؛ که‌ڕه‌سوول به‌سه‌ی؛ یه‌ک له شوێن یه‌کدا بوون ‹یک مشت عمله پای دیوار ریسه شده بودند: کۆمه‌ڵێ کرێکار له پاڵ دیواره‌که‌دا قه‌تاریان به‌ستبوو›.

هه‌روه‌ها: **ریسه کردن**

ـ **ریسی** / rîsî/: *پیوازه.* ـڕێسی؛ ڕستن ‹پشم‌ریسی: خوری‌ریسی›.

**ریسیدن** / rîsîdan/: *مصدر. متعدی.* // **ریسیدی:** ڕستت؛ **می ریسی:** ده‌ڕێسی؛ **بریس:** بڕێسه// ڕستن؛ ڕێسان؛ ڕسین؛ ڕێسه‌ی؛ ڕێسای؛ ڕێسته‌ی؛ مووناندن؛ هۆنینه‌وه؛ هۆندنه‌وه؛ هۆنه‌ی؛ مۆنێ؛ مونین؛ وادای؛ بادان ‹نخ ریسیدن: به‌ن ڕستن›: **ڕشتن**. هه‌روه‌ها: **ریسیدنی**

■ صفت فاعلی: **ریسنده** (ـــ)/ صفت مفعولی: **ریسیده** (ڕێستراو)/ مصدر منفی: **نَریسیدن** (نه‌ڕستن)

**ریش**[1] / rîš/: *اسم.* ریش: ۱. ردێن؛ ئه‌ڕدێن؛ ڕندێن؛ ڕێن؛ ڕین؛ ڕی؛ ڕهـ؛ ڕیهـ؛ ڕێوی؛ هه‌ردیسه؛ ڕهه؛ موویه‌ک که له ڕوومه‌ت و زۆرتر له چه‌ناکه و ژێر زنج و گوپی پیاودا ده‌ڕوێ ۲. موویه‌کی درێژ که له چه‌نه و ژێر چه‌نه‌ی بڕێک گیانله‌به‌ران (وه‌ک بزن) ده‌ردێ ۳. *[ادبی]* ڕێش؛ زام؛ زه‌خم؛ زیه‌م؛ برین.

◙ **ریش بزی:** ڕیشی ترێشته‌یی؛ ڕیشی بزنی؛ ڕیشێکی پڕ و ته‌نیا به چه‌ناگه‌وه.

**ریش توپی:** کۆزه‌ره؛ ڕیشی‌خپ؛ ڕدێنی تۆپ؛ ڕیشی تۆپه‌ڵ؛ ڕیشێکی پڕ به په‌ڕانپه‌ری ده‌موچاوه‌وه.

**ریش محرابی:** ڕیشێک به شێوه‌ی هه‌له‌ک.

◘ **ریش تراشیدن:** ڕیش تاشین؛ ڕیش کره‌دای؛ مووی ده‌موچاو لابردن: **ریش زدن** *[گفتاری]*

**ریش چیزی درآمدن:** *[مجازی]* شڕ له شتێ بڕیان؛ کۆن/ کۆنه بوون؛ بێبره‌و بوون؛ شڕوو چێوێوی شنیه‌ی؛ مه‌ڕاش بوون ‹این حرفها دیگر ریشش درآمده: ئه‌م قسانه ئیتر شڕیان لێ براوه›.

**ریش خود را به دست کسی دادن:** *[کنایی]* خۆ به که‌سێ سپاردن؛ خۆ له به‌ر ده‌ستی که‌سێ نان ‹تو نباید ریش خودت را به دست او بدهی: تۆ نابێ خوت به‌و بسپێری›.

**ریش خود را در آسیا سفید کردن:** *[کنایی]* سه‌ری خۆ له ئاشدا/ سه‌ر له به‌ر تاوێ سپی کردن؛ گیا به کێوه‌وه خواردن؛ نانه به گۆشێ ژاوه‌ی/ ژاوای؛ له ژیان ئه‌زموون وه‌رنه‌گرتن و له نه‌زانیدا پیر بوون ‹خیال نکن من ریش خودم را در آسیا سفید کرده‌ام: وا مه‌زانه، سه‌رم له ئاسیاودا سپی کردووه›.

**ریش زدن** ☜ **ریش تراشیدن**

**ریش کسی را گیر انداختن:** *[کنایی]* پای که‌سێ گیردان؛ سه‌ری که‌سێ به په‌ته‌وه کردن؛ که‌سێک گیر خستن ‹قسطهایش را نداد و ریش مرا پیش فروشنده گیر انداخت: قسته‌کانی نه‌دایه‌وه و پای منی لای فرۆشه‌ره‌وه گیردا›.

**ریش گذاشتن:** ۱. ڕیش هێشتنه‌وه؛ ڕیش دانان؛ ڕیشه‌وه ئاسه‌ی ‹تازگی ریش گذاشته و اهل مسجد شده: به تازه‌یی ڕیشی هێشتوه‌ته‌وه و ئاموشۆی مزگه‌وت ده‌کا› ۲. ☜ **ریش گرو گذاشتن**

**ریش گرو گذاشتن:** *[کنایی]* سمێڵ دانان؛ به‌ڵێنی ئه‌خلاقی دان ‹من به خاطر تو ریش گرو گذاشته‌ام: من بۆ تۆ سمێلم داناوه›: **ریش گذاشتن ـ ۲**

**ریش و قیچی را به دست کسی دادن:** *[کنایی]* گه‌ز و قه‌یچی/ مقه‌ست دانه ده‌س که‌سێکه‌وه؛ له کارێکدا ئیختیاری ته‌واو دان به

کەسێک ‹من دیگر ریش و قیچی را به دست شما می‌دهم تا خودتان کار را تمام کنید: ئەوە ئیتر گەز و قەیچی دەدەم بە دەستی ئێوەوە تا خۆتان کارەکە تەواو کەن›.

**از ریش کسی خجالت کشیدن:** لە مووی سپی کەسێک شەرم کردن؛ رێز لە تەمەن و بەساڵاچوویی کەسێک گرتن؛ لە ریش چەرمگ کەسێ خەجاڵەت کێشان.

**به ریش کسی بستن:** *[کنایی]* کردنە ریش کەسێکەوە؛ بەسەردا سەپاندن؛ بە ملەوکردن ‹همه جمع شدند و این ماشین قراضه را به ریش من بستند: هەمووکۆ بوونەوە و ئەم ماشینە کەلاکەیان کردە ریشمەوە›.

**به ریش کسی خندیدن:** بە کڵاو کەسێ تیتاڵی کردن؛ بە کەسێ پێکەنین؛ گاڵتە بە کەسێک کردن ‹می‌خواهی همه به ریش من بخندند؟: گەرەکتە هەموو بە کڵاوم تیتاڵی بکەن؟›.

**به ریش گرفتن:** *[مجازی]* بە ڕاست زانین؛ بڕوا هێنان؛ باوەرکردەی ‹چند بار بچه‌ها، استاد_ استاد گفتند و او هم به ریش گرفت: کورەکان چەن‌جار مامۆستا_ مامۆستایان وت و ئەویش وایزانی ڕاستە›.

**ریش$^{2}$:** صفت. ۱. ڕێش؛ بریندار؛ ئازراو؛ زەخمار؛ زامدار؛ زامار؛ گەزنگاز ۲. ☜ **ریش_ ریش**

**ریش‌بابا** / rîšbābā ، ـها/: اسم. سەرەقوولە؛ ریش‌بابا؛ هەنگوورە کەڵەشێری؛ چەشنێ ترێی دەنک‌درێژ و درشتی ئاودار.

**ریشتر** / rîšter/: [از انگلیسی] اسم. ریشتر؛ یەکەی ژمارەیی پێوانی لەراندنەوەی بوومەلەرزە کە بە ژمارەگەلی ۱ تا ۹ پیشان دەدرێ.

**ریش‌تراش** / rîštarāš ، ـها/: اسم. ریش‌تراش؛ ریش‌تاش؛ خۆتراش؛ خۆتاش؛ خودتەراش؛ مەکینەی ریش تاشین.

**ریشخند** / rîšxand/: اسم. ڕشخەن؛ ریشخەن؛ رشقەن؛ قەژمەری؛ تەوزە؛ کاری گاڵتە کردن و پێکەنین بە کەسێ.

▣ **ریشخند شدن:** ریشخەن بوون؛ بوونە ڕشخەن؛ گاڵتە پێ کران ‹به حرفش اهمیتی ندادند و از سوی حاضران ریشخند شد: بایەخیان بە قسەکانی نەدا و لە لایەن دانیشتوانەوە ریشخەن بوو›.

**ریشخند کردن:** گاڵتەکردن؛ ریشخەن کردن ‹آن روز همه او را ریشخند می‌کردند: ئەو رۆژە هەموو گاڵتەیان پێ دەکرد›.

**ریشدار** / rîšdār ، ـها/: صفت. ریشن؛ ریشوو؛ ریشدار؛ بە ڕدێن؛ خاوەن ریش ‹یک آقای ریشدار پشت میز نشسته بود: کابرایەکی ریشن لە پشت مێزەکەوە دانیشتبوو›.

**ریش_ ریش** / rîšrîš/: صفت. ریشاڵ_ ریشاڵ؛ ریزاڵ_ریزاڵ؛ زیڤاڵ_ زیڤاڵ؛ لێک‌هەڵوەشاو و دڕاو؛ بە ریسە یان هەوداگەلی لێک‌پساوەوە: ریش

**ریش‌سفید** / rîšsefîd ، ـها؛ ـان/: اسم. ریش‌سپی؛ ریسپی؛ ریش‌چەرمگ؛ ریش‌چەرمە؛ ئیختیار؛ پیاوماقووڵ؛ پیاوی بەساڵاچووگ و بەئەزموون و زانا ‹یک ریش‌سفید نداشتید، دعوا را بخواباند؟: ریش‌سپیەکتان نەبوو، شەڕەکە دامرکێنێ؟›.

بەرانبەر: **گیس‌سفید**

**ریشک** / rîšak/ ☜ **ریشه‌نما**

**ریشگی** / rîšegî/ ☜ **رادیکال$^{1}$_۲**

**ریشو** / rîšû ، ـها/: صفت. *[گفتاری]* ریشدار؛ بەڕدێن؛ ڕدێن‌دار؛ ریشوو؛ ریشن؛ ریهـ درێژ.

**ریش و پشم** / rîš-o-pašm/: اسم. *[تعریض]* کوڵک و موو؛ ریش و پەشم؛ سەر و ریش؛ مووی درێژ و پڕی سەر و ڕوو ‹با یک خروار ریش‌وپشم آمده بود عروسی: بە خەرواریٚ کوڵک‌مووەوە هاتبووە زەماوەن›.

**ریشه** / rîše ، ـها/: اسم. ریشه: ۱. ریشگ؛ ئاجار؛ پنجار؛ پنج؛ پنجک؛ بنج؛ ڕپن؛ قورتیس؛ ڕەگ و بنی گیا؛ بەشی بنەهەردی گیای تۆمدار کە

ئەندامی کێشان و نیاتەکردنی زەوا یان هۆی پتەوی و بنەگری گیایە و بە نەبوونی گریٚ، چرۆ و گەلا لە لاسکەکەیدا، دەناسرێتەوە ‹ریشەی درخت: ریشەی دار› ۲. بنەچەک؛ بنەڕەت؛ بنیات؛ بنەما و سەرچاوەی شتێک ‹باید ریشەی بی‌سوادی را کند: دەبیٚ ریشەی نەخوێندەواری لە بن دەربیٚ› ۳. *[مجازی]* ڕەگ و ڕیشە؛ ئاخێزگە یان مێژینەیەکی دیار و ڕوون ‹دشمنی آنان ریشە در گذشتەهای دور داشت: دژمنایەتیان ڕەگ‌وڕیشەیێکی کۆنی هەبوو› ٤. ڕیشۆ؛ ئاخری ڕێسەگەلی تەنراو (وەک قوماش و قالی) کە بۆ جوانی نەچندراوە ٥. *[زبان‌شناسی]* شێوەی سەرەتایی وشە ٦. *[زبان‌شناسی]* ڕەگ؛ وشەیێ کە بە زێدەکردنی وەن یان وشەیەکی‌تر، وشەیەکی نوێی لیٚ چیٚ بکریٚ (وەک: «رو» کە وشەگەلی: روشتن، برو، پیشرو و... لیٚ دروست دەبیٚ).

▣ **ریشەی افشان:** *[گیاه‌شناسی]* چەشنیٚ ڕیشە کە لە نێوان ڕیشەی سەرەکی و لاوەکیدا جیاوازیەکی بەرچاو نیە (وەک ڕیشەی گەنم).

**ریشەی دندان:** کولابە؛ ڕیشەی ددان؛ ڕەگی ددان؛ ڕیشەو ددانی؛ بەشیٚ لە ددان کە لە نێو پووکدایە.

**ریشەی راست:** *[گیاه‌شناسی]* جۆرێک ڕەگ کە ڕیشەی سەرەکی تێیدا گەشەیەکی زۆر دەکا و ڕێک ڕۆ دەچیٚ بە زەویدا و وردەڕیشەی بە دەور و بەردا دەڕویٚ.

**ریشەی غدّەای:** *[گیاه‌شناسی]* جۆرێک بنج کە زەوای تێدا کۆ دەبێتەوە (وەک بنجی گێزەر و سێفەزەمینی).

**ریشەی فرعی:** *[گیاه‌شناسی]* ڕیشووگەلی باریک کە لە ڕیشەی سەرەکی دەبنەوە.

**ریشەی مو:** پیاز مو ☜ **پیاز**

**ریشەی مویین:** تەڵ؛ تەڵی هەڵمژ ☜ **تارا**

**ریشەی نابجا:** *[گیاه‌شناسی]* ڕیشەی ناوەجیٚ؛ چەشنیٚ ڕیشە کە لە بەشگەلی جۆراوجۆری گیا (وەک لاسک، گەڵا و دووچکەگەڵا) پێک‌دیٚ.

**ریشەی هوایی:** *[گیاه‌شناسی]* ڕیشەی هەوایی؛ چەشنیٚ ڕیشە کە لە دەرەوەی خاکدا لە سەر بەشگەلی هەوایی گیاوە دەردیٚ.

▣ **ریشەی چیزی را خشکاندن/ قطع کردن:** *[کنایی]* شتێک لە بن دەرهێنان؛ بنبڕکردن؛ بنەبڕ کەردەی؛ یەکسەرە توونا کردن.

**ریشە دواندن:** ۱. ڕیشە داکوتان؛ ڕیشە کوتان؛ ڕەگەوە وەتەی؛ ڕەگ بەردەی/ پێکەی؛ ڕەگاژۆ کردن و پەرە سەندنی ڕیشە ‹بە زودی در خاک ریشە دواند و رشد کرد: زۆر زوو ڕیشەی داکوتا و گەورە بوو› ۲. *[کنایی]* چنگ داکوتان؛ چنگ دادان؛ تەنینەوە؛ تەشەنە کردن ‹فساد در همە جا ریشە دوانده بود: گەندەڵی لە هەموو شوێنێکدا چنگی داکوتابوو› ✽ **ریشە کردن**

**ریشە کردن:** ۱. ڕیشەکردن؛ بە ڕیشە بوون؛ ڕیشەدار بوون ۲. ☜ **ریشە دواندن**

**از ریشە درآوردن:** ۱. لە ڕیشە دەرهێنان؛ بێخەنە کەفتەی؛ دەرهێنانی گیا بە ڕیشەوە ۲. ☜ **از ریشە کندن**

**از ریشە کندن:** *[کنایی]* لە ڕیشە دەرهێنان؛ بنبڕ کردن؛ تەفر و توونا کردن: **از ریشە درآوردن**

**تیشە بە ریشەی چیزی/ کسی زدن** ☜ **تیشە**

**ریشەای**[1] / rîše'î/: *صفت*. بنەڕەتی؛ بنیاتی؛ بنەمایی؛ ڕیشەیی ‹معالجەی ریشەای: دەرمانی بنەڕەتی›.

**ریشەای**[2]: *قید*. بنەڕەتی؛ ڕیشەیی؛ سەرەکی؛ بنەمایی؛ بە شێوەی بنەڕەتی؛ بە شێوەی بنەمایی ‹در مورد مبارزه با فساد باید ریشەای عمل کرد: لەمەڕ ململانیٚ لەگەڵ گەندەڵیدا دەبیٚ بنەڕەتی کار بکریٚ›.

**ریشە پوش** / rîšepûš ، ـها/: *اسم*. *[گیاه‌شناسی]*

پەلاش؛ کالانێ کە ڕیشەی سەرەتایی گەنم و خەلەی‌تر دەپۆشێ.

**ریشەچە** / rîšeče/: *اسم. [گیاەشناسی]* ڕیشۆکە؛ بنەچەکە؛ بنچەکە؛ ڕیشەی تۆلی گیاگەلی تۆمدار کە پاشان دەبنە ڕیشەی سەرەتایی.

**ریشەدار** / rîšedār/: *صفت.* ڕیشەدار؛ ڕەگدار؛ پنجدار؛ بەڕەهە؛ بەبن ‹گیاهان ریشەدار؛ خانوادەی ریشەدار: گیای ڕیشەدار؛ بنەماڵەی ڕەگدار›.

**ریشەشناسی** / rîšešenāsî/: *اسم.* ڕیشەناسی: ١. بەشێ لە زانستی زمانناسی کە بە لێکدانەوەی گۆڕانی جار لە دووی جاری وشە تا گەییشتن بە شێوازی سەرەکی دەپەرژێ ٢. لێکۆڵینەوە لەمەڕ سەرچاوەی بەدیهاتنی شتێ، بەتایبەت ئاخێزگە و هۆی بەدیهاتنی نەخۆشی.

**ریشه کن** / rîšekan/: *صفت.* بنبڕ؛ بنەبڕ؛ بێخبڕ؛ قڕ؛ شپنە؛ شولگەنە؛ شوێنەوار بڕاو: ١. بنبڕاو لە ڕیشە ‹توفان درختان را ریشه‌کن کرد: باسریشک، دارەکانی بنبڕ کرد› ٢. نابووت؛ لەبەین‌چوو ‹بیماری آبله در جهان ریشه‌کن شد: نەخۆشی هاولە لە جیهاندا بنبڕ کرا›.

**ریشه کنی** / rîšekanî/: *اسم.* بنبڕی؛ بنەبڕی؛ شوێنەواربڕی؛ کار یان ڕەوتی هەڵکەندن یان لەنێو بردن و یافت بڕینی شتێک.

**ریشەنما** / rîšnemā ، ـها/: *اسم. [گیاەشناسی]* ڕیشۆڵە؛ هەر یەکە لە ڕیشەگەلی تەسکی وەکوو تاڵ، لە برێ ڕوەکدا کە کاری کێشانی ماک لە زەویەوە دەکەن: **ریشک**

**ریع** / rey'/: [عربی] ☜ **ری ـ٢**

**ریغ** / rîq/: *اسم. [مستهجن]* فیڕ؛ فیڕکە؛ قڕک؛ ڤژۆ؛ تەقەفیڕە؛ تړووشقە؛ تڕاڵێ؛ گووشە؛ فیقە؛ پیسی زگچوو: **ریق**

⊡ **ریغ افتادن:** فیڕان؛ زگچوون؛ سکچوون؛ پا کار کردن؛ شاتان؛ زگ ڕۆیین؛ فیڕکان؛ فیڕیان؛ هەڵشوولان.

**ریغ(ش) درآمدن:** *[کنایی]* جیق(ی) دەرهاتن؛ جیق و فیق دەرهاتن؛ بێ‌هێز و لاواز بوون.

**ریغ رحمت را سر کشیدن:** *[تعریض]* ئاوی ژیان هێق کردن؛ قاچ جووت بوون؛ سلار بوونەوە؛ سل سارد بوونەوە؛ مردن.

**ریغماسی** / rîqmāsî/ ☜ **ریغو**

**ریغو** / rîqû/: *صفت. [مستهجن]* ١. فیرن؛ فیڕن؛ ڕیخن؛ سکچووگ ٢. *[مجازی]* ڕیخوو؛ ڕیقن؛ ڕەقەڵە؛ داڵگۆشت؛ گوجەر؛ گاندایش؛ دەغەزار؛ لەڕ و لاواز؛ بێ‌هێز و بێچوو؛ لە نەخۆش چوو * **ریغماسی**

**ریق** / rîq/ ☜ **ریغ**

**ریکشا** / rîkšā ، ـها/: [؟] *اسم.* ڕیکشا؛ ئامێرێکی گواستنەوە بۆ هەڵگرتنی ڕێبوارێک، بە دوو چەرخی بڵیند و دوو دەستە لە پێشەوە، کەسێک دەیکێشا و تا ١٠ـ٢٠ ساڵ پێشتر لە برێ وڵاتانی ئاسیادا باو بوو.

**ریگ** / rîg ، ـها/: *اسم.* ڕێخ؛ ڕیخ؛ ڕیز؛ خیز؛ زیخ؛ خڕ؛ سیلک؛ سیل؛ ڕەفڵ؛ ڕتام؛ ڕەلم؛ ڕەمڵ؛ مڵ؛ لیم؛ لم؛ قووم؛ قوم؛ خار؛ دانە بەردگەلی کەمتاکورت خڕ (گەورەتر لە چەو) کە بە هۆی ئاو یان باوە ورد بووگن و سواون.

⊡ **ریگ‌روان:** ڕیز؛ ڕمڵ؛ کۆمایێکی زیخ کە بە هۆی هەڵکردنی باوە ئەم لا و ئەو لا دەکا و گردەلم پێک دێنێ.

⊡ **ریگ ته جوی آب بودن:** *[مجازی]* بەردی بن‌گۆم بوون؛ مانا و هەرمان بوون ‹ما در اینجا ریگِ تهِ جوی آبیم، ولی دیگران می‌آیند و می‌روند: ئێمە لێرە بەردی بن‌گۆمین، بەلام کەسانی دیکە دێن و دەڕۆن›.

**ریگی به کفش داشتن:** *[مجازی]* شتێ لە ژێر کلاودا بوون؛ ڕێخ لە کلاشا بوون؛ بە ویستێکی

نارەوا یان تاوانێکەوە بوون ‹اگر ریگی بە کفشت نیست، چرا حرف نمی‌زنی؟: ئەگەر شتی لە ژێر کلاوتدا نیە، بۆ قسە ناکەی؟›.

**ریگزار** / rîgzār ، ـها/:اسم. ریخەلان؛ ڕیخناخ؛ زیخەلان؛ سیلاخ؛ کەڤیشتن؛ کەوەڵە؛ هوسکو؛ قومەلان؛ ڕەلماوی؛ لمەلان؛ جێ ڕەلم؛ زەوی داپۆشراو لە زیخ.

**ریگ‌شور** / rîgšûr/:اسم. ڕێخەوشۆر؛ نیسکەشۆر؛ نیسکەوشۆر؛ کار و ڕەوتی شۆردنی خەلە و دانەوێڵە بۆ خاوێن کردنەوەی لە ڕیخ و خاک و خۆڵ.

**ریگ‌ماهی** / rîgmāhî/ ☜ **سقنقور**

**ریل** / reyl ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ڕەیل:
١. پێکهاتەیەک لە ڕاهێلی پۆلایی بە شێوەی ┻ کە لە هەر دوولای ڕێئاسندا، لە سەر تراوێرس دادەنرێن و چەرخی قەتار بە سەریاندا دەڕوا ٢. میلەیێکی پتر کانزایی و لێوارەدار کە ئامێرێک بە چەرخی گنجڕەوە بە سەریدا دەڕوا ٣. پێکهاتەیەکی گنجڕـگنجڕ کە ئامێرێکی تێدا یان بە سەردا دەخلیسکێ.

**ریل‌گذاری** / reylgozārî ، ـها/: [انگلیسی/ فارسی]/اسم. ڕەیل‌دانەری؛ کار یان ڕەوتی دانان و دامەزراندنی ڕەیل، بەتایبەت لە ڕێگای هێڵی ئاسندا.

**ریم** / rîm/:اسم. چڵک؛ کیم؛ زووخ؛ زنچک؛ زیچک؛ زیچکاو؛ زنچکاو؛ زەرداوی برین.

**ریمل** / rîmel/: [فرانسوی]/اسم. ڕیمیل؛ ماکێکی ڕەنگی چەور و ڕەش بۆ ڕەشتنی برژانگ.

**رینگ** / rîng ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ڕینگ:
١. مەیدانی کێبەرکێی مستانی کە دەوراندەوری بە تەناف گیراوە ٢. *[مکانیک]* بازنەیەکی چودەنی کە پیستون لە سەر سیلەندرەوە ڕادەگرێ و لە تێچوونی گاز بۆ ناو کارتێل یان ڕۆن بۆ ناو سیلەندر بەرگری دەکا ٣. بازنەی کانزایی چەرخی ماشین، کە تەگەرەی پێوە دەنرێ.

**ریواس** / rîvās ، ـها؛ ـان/:اسم. ڕێواس؛ ڕێواسی؛ ڕیڤاس؛ ڕێواو؛ ڕێواوی؛ ڕاوەند؛ ڕبێز؛ ڕبێس؛ ڕمبێز؛ ڕمێز؛ نێر؛ قاڵەقنگ؛ قەلاقنگ؛ قەلاعنی؛ زەڕنیلە؛ نێرتکی باسکلاو؛ نیرتکە گیایەکی ترش و خۆشی کەمتەمەن، تایبەتی ناوچەی شێدار، کە دەگەڵ بەفر چوونەوە دەردەکەوێ و بۆ مرەبا و شەربەت و چێشت بەکاردێ.

**ریون** / riyon/: [فرانسوی]/اسم. ڕیۆن؛ جۆرێ هەودای دەسکردی وەکوو هەورێشم.

**ریوی** / riyavî/: [عربی] صفت. سیپەلاکی؛ سیەی؛ پێوەندیدار بە ئەندامی هەناسەدانەوە ‹بیماری ریوی: نەخۆشینی سیپەلاکی›.

**ریه** / rîye ، ـها/: [عربی]/اسم. سی؛ سیپەلاک؛ سیپەلک؛ جگەری سپی؛ هەر کام لە دوو پێکهاتەی کیسەئاسای پڕ لە هەوا لە نێو پەراسووی مرۆ و مۆرغەدارانی بالادا کە ئەندامی سەرەکی هەناسەدانە.

**رییس** / rayîs ، ـها؛ ـان؛ رؤسا/: [عربی]/اسم. سەرۆک: ١. بانترین پێگەی جێبەجێ کردن لە دامەزراوە یان ڕێکخراوەیەکدا ٢. سەردەستە یان ڕێبەری گرۆ ❊ **رئیس**

▣ **رییس جمهور/ جمهوری**: سەرۆک کۆمار؛ سەرکۆمار؛ هەڵبژاردراوی خەڵک بۆ سەرۆکی وڵات.

**رییس خانواده**: سەرۆکی خێزان؛ سەرۆکی ماڵ؛ یانەوان؛ کەسێ کە سەرپەرشتی و بەڕێوەبردنی خانووی وەئەستۆە.

**رییس دزدان**: سەرۆک دزان؛ دایکە دزان؛ سەردەستەی دزان (زۆرتر لە فیلم و شانۆدا).

**رییس‌الوزرا** / rayîsolvozarā/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* سەرەک/ سەرۆک‌وەزیر.

# ز

**ز** / z/: *حرف.* ز؛ نیشانەی پیتی سێزدەهەمی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**ز**[1] / ze/: *اسم.* زێ؛ ناوی سێزدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**ز**[2]: *حرف. [مخفف، ادبی]* لە؛ نە؛ جە؛ دە؛ وە؛ ژ ‹زگفتار او شاد شد: لە ڕاوێژی گەشایەوە›.

**زا**[1] / zā/: *اسم.* ۱. زێ؛ نێوی عەرەبی سێزدەهەم پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی ۲. سک؛ زک؛ لەمە؛ زگ‌وزا؛ زا؛ کاری زایین؛ زارۆ بوون ‹مادرش سر زا رفته است: دایکی لە سەر سکەوە چووە›.

▣ **سر زا رفتن** ☜ **سر**[3]

ـ **زا**[2]: *پیواژە.* ــ زا؛ ـ زێ؛ ـ هێن؛ بزێ ‹بچەزا: زاورزا›.

**زائد** / zā'ed/: [عربی] ☜ **زاید**

**زائدالوصف** / zā'edolvasf/: [عربی] ☜ **زایدالوصف**

**زائده** / zā'ede/: [عربی] ☜ **زایده**

**زائر** / zā'er/: [عربی] ☜ **زایر**

**زائل** / zā'el/: [عربی] ☜ **زایل**

**زائو** / zā'û ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* زێسان؛ زەیسان؛ زەیستان؛ زیسان؛ زاوران؛ زاوەران؛ تازەزا؛ زەیسانە؛ ژنێ کە دەزێ یان تازە زاوە.

ـ **زائی** / zā'î/ ☜ **زایی**

**زائیدن** / zā'îdan/ ☜ **زاییدن**

**زابراه** / zāberā(h)/: *صفت. [گفتاری]* ۱. زالەترەک؛ زار؛ دڵنەماو؛ دڵداکەوتوو؛ دڵئاشێو؛ دڵپەشێو؛ ناتواو؛ تووشیاری دڵەڕاوکێ و بیرئاڵۆزی ‹دیشب سارا دیر آمد و همه را زابراه کرد: دوێشەو سارا دێر هاتەوە و هەمووانی زالەترەک کرد› ۲. *[مجازی]* مەرژیر؛ ترافیە؛ بەرەزە؛ تەرە؛ زایە؛ دەربەدەر؛ ئاوارە ۳. سەرگەردان؛ سەرلێشێواو؛ سەرسام.

**زابگر** / zābgar, zābgor/: *اسم. [قدیمی]* گوپچڕ؛ گوبجڕ؛ پلۆمە؛ مستێ کە لە زاری پڕ لە پفەوە دەدرێ تا با بە دەنگەوە بای لێ فت بێ.

**زاپاس** / zāpās ، ـها/: [روسی] *صفت.* سپێر؛ زاپاس؛ پێتەک؛ یەدەک؛ بە بار و لۆری ئامێری جێگرەوە ‹تایر زاپاس: تەگەرەی سپێر›.

**زاج** / zāc/: [معرب از کردی] *اسم. [شیمی]* زای؛ زاگ؛ زاخ؛ زاج؛ ساچ؛ شەب؛ هەموو جۆرە خوێی ئالومینیومداری ئەسید سوولفۆریک، کە گەردێکی سپی، بێ‌بۆن و ئاڵە.

▣ **زاج آبی**: قاژقاژە؛ ژەنگار؛ مووروە شینە؛ مووروە شین؛ مووروی شین؛ زاخی شین؛ کانزایەکە بە ڕەنگی شینی تۆخ کە بۆ دەرمان دەشێ.

**زاج آهن**: زای ئاسن؛ مووروەی ئاسن؛ سولفاتی دوو بەرامبەرکراوەی ئاسن و

پوتاسیوم، تەنی نەگۆڕی وەنەوش کە لە ئـاودا دەتوێتەوە.

زاج سبز: قیژاڵکە؛ مردارسـەنگ؛ مرداسـەنگ؛ شەبی سەوز؛ زاخی سـەوز؛ سـولفاتی ئاسـنی بلۆرئاسا، خوێی سەوز کە لە ئاودا دەتوێتەوە و بووژێنەرە و بۆ ڕەنگـرێژی و دروسـتـکـردنی مرەکەف بە کار دێ.

زاج سـفید: سـولفاتی دوانـەی ئـالومینیوم و پوتاسیوم، تەنێکی نەگۆڕ و بێڕەنگ، بلۆرئاسا بە شێوەی هەشت پاڵـووی ڕێـک، زۆرتـر لـە ئـاوی گەرمـدا دەتوێتـەوە و لـە ڕەنگکـاری و دەباغی و بژیشکیدا بە کار دێ.

زاج سوخته: سیازاخ؛ قڵیاو؛ زاخێکی سپی کـە پاش توانەوە و ساردەوە بـوون دیـسان تـینی پێـدراوە و ئـاوەچن بـووە و وەک کۆمـاییێکی سپی کون-کونی لێهاتووە.

**زاجـــسنگ** / zācsang/: [معـرب/ فارسـی]/اسـم. زاخەبـەرد؛ بـەردی ئـالوم؛ سـولفاتی ئـاوداری ئالومینیوم، بریتی لە پوتاس، ئالومین و جار-جار هێندێک سودیوم کـە لـە بەردگـەلی گڕکانیـدا بەدی دەکرێ: **سنگ آلوم**

**زاد**[1] / zād/: اسـم. ۱. زا؛ زێ؛ زەهـا؛ زاد؛ زەو؛ زگـوزا؛ زک و زا؛ سـک و زا؛ زا و زێ؛ زا و زو؛ زۆمە؛ زایەنە (بۆ ئاژەڵ)؛ ڕەوتی زایـین ‹زاد و ولد کردن: زا و زێ کردن› ۲. زاوەرە؛ بەچکە؛ منـداڵ؛ ڕۆڵـە؛ زارۆ؛ زا؛ زاور؛ زاوڵـە؛ زارۆڵـە؛ زوە؛ ئایـل ۳. [عربی]/ادبی/ شەن؛ زاد؛ زەواد؛ زەود؛ تێـشوو؛ توێـشە؛ تۆشـە؛ زەوا؛ بژێـوی سـەفەر ‹زاد راه: راشەن›.

**زاد ـ**[2]: پیشوا‌ژه. زاـ ؛ زەها؛ لە دایک بوون ‹زادروز: زارۆژ›.

**ـ زاد**[3]: پیوا‌ژه. ـ زا؛ ـ زاد: ۱. بەچکەـ ؛ منـداڵ ‹پریزاد: پەریزا› ۲. ـ بـوو؛ زاو؛ زاگ؛ لـە دایـک بووگ؛ بە دنیا هاتوو ‹نوزاد: نۆزاد›.

**زادآوری** / zādāvarî/: اسـم. زا و زێ؛ زا و زوو؛ زەو؛ زگـوزا؛ زکـوزا؛ سکـوزا؛ زا و زوە؛ کار یـان ڕەوتی تۆرەمە خستنەوە ‹سن زادآوری در انسان ۳۰ سال است: تەمەنی زا و زێ لە مرۆدا ۳۰ ساڵە›.

**زادبوم** / zād-o-bûm/: اسم. /ادبی/ زێـد؛ زاگـە؛ شوێنەزا؛ جاخ؛ وار؛ نیشتمان؛ شوێنی لـە دایـک بوون.

**زادراه** / zādrāh/: اسم. تۆشەرێ؛ ڕاشەن؛ زەودە؛ توێشووی ڕێگە.

**زادروز** / zādrûz/: اسـم. زارۆژ؛ ڕۆژی لـە دایـک بوون؛ ڕۆژی هاتنە دنیای کەسێک.

**زادگاه** / zādgāh/: اسـم. زێـد؛ زاگـە؛ زادگەهـ ؛ شوێنەزا؛ زاینگە؛ شوێنی لە دایک بوون.

**زادن** / zādan/: مصدر. متعدی. لازم. /ادبی/// **زادی**: زای؛ **مـیزایـی**: دەزێـی؛ **بِـزا**: بـزێ// □ متعـدی. ۱. بـوون؛ دیـن؛ دیـەی؛ بـەدیهێنان؛ وە دیـر هاوردن؛ زارۆک بوون؛ زاوڵە دیەی؛ وینای؛ بێچۆ دیتن؛ منداڵ هێنان؛ بێچوو هێنان ‹زادن و کشتن و پنهان کردن/ دهر را رسم و ره دیـرین است: بـوون و کوشتن و دەژێرخاک ڕاکردن/ ئاکاری لـە مێژینـەی ڕۆژگارە› ۲. /مجازی/ بەدیهێنان؛ هێنانـە ئـاراوە؛ هێنانـە گـۆڕ □لازم. ۳. زایمـانکـردن؛ لـە بـار بوونەوە؛ زان؛ زایـن؛ زایـین؛ زەی؛ زای؛ زایـش؛ زهین؛ زەهین؛ زەهان؛ زایەنە (بۆ ئـاژەڵ) ٤. لـە دایک بوون؛ بە دنیا هاتن؛ بـوون؛ پەیـدا بیـەی؛ بیـەی؛ زان؛ زایـن؛ زایـین؛ زەی؛ زای؛ زایـش؛ زهین؛ زەهین؛ زەهان ‹یارب از مادر گیتـی بـه چـه طـالع زادم؟: خوایـە بـە چ ناوچاوێکـەوە زاوم؟› ٥. /مجازی/ سەرهەڵدان؛ لێوەهاتن؛ پەیدا بیەی؛ بیەی؛ وە بەر هاتن؛ دەرهاتن؛ بەرئامەی؛ بـوون؛ زان؛ زایـن؛ زایـین؛ زەی؛ زای؛ زایـش؛ زهـین؛ زەهین؛ زەهـان؛ هاتنـە ئـاراوە ‹آیا فقر از جهـل می‌زاید یـا جهـل از فقـر؟: ئایـا نـەداری لـە نەزانیـەوە سەرهەڵـدەدا یـان نـەزانی لـە نەداریـەوە؟› ٦. /مجـازی، قـدیمی/ زانـەوە؛ زیـەی؛ زیـای؛ هەڵقولان؛ هەڵقولیان؛ هەڵقولتان؛ هەڵقولتیان؛

هەڵقوڵین؛ جۆشان؛ جۆشیان؛ دەردان؛ دانە دەر؛ تەقەی؛ تەقای؛ دەڵانی ئاو دە کانی و زناودا.
هەروەها: **زادنی**

■ صفت فاعلی: **زاینده** (ــ)/ صفت مفعولی: **زاده** (زاو)/ مصدر منفی: **نَزادن** (نەزایین)

**زاد و رود** / zād-o-rûd/: *اسم. [گفتاری]* زار و زیچ؛ زایا؛ زازا؛ زاڤ و زیچ؛ زاڤ و زێچ؛ وەچ و بەرە؛ زا و زیچ؛ زێر و زیچ؛ کوڕەزا و کچەزا و هەموو ئەوانەی کە لە کەسێکەوە بەدیهاتوون ‹بعد از آن زمین‌لرزه، همهٔ زاد و رود او کوچ کردند و آمدند شهر: دوای ئەو بوومەلەرزە، هەموو زار و زیچی باریان کرد و هاتنە شار›.

**زاد و ولد** / zād-o-valad ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* زکوزا؛ سک و زان؛ زگوزا؛ زەو؛ زاوزوو؛ زا و زێ؛ زاد و وەڵەد؛ زایەنە (بۆ ئاژەڵ) ‹گوسفندان زاد و ولد کردند: پەزەکان زکوزایان کرد›.

**ـ زاده** / zāde ، ـها؛ ـگان/: *پیواژە.* ـ زادە؛ ـ زایە؛ بێچوو؛ منداڵ ‹شاهزاده: شازادە›.

**زار** [1] / zār/: *اسم.* ۱. شین؛ شیوەن؛ شەپۆڕ؛ ڕۆڕۆ؛ کەوگری؛ کەڵگری؛ گریان بە دەنگی بەرز ۲. *[فرهنگ‌مردم]* جنۆکەیێ کە بە بڕوای بڕێ لە خەڵکی ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا و دەور و بەری زەریای عەمان و کەنداوی فارس، ئەگەر بچێتە نێو لەشی هەر کەسێکەوە، تووشی نەخۆشینی دەکا و بۆ تاراندنی لە لەشی نەخۆش، ڕێوڕەسمێکی تایبەتی وێڕای گۆبەندی بۆ دەگێڕن.

⊡ **زار زدن:** زارین؛ زمیهتن؛ زمین؛ زاریان؛ زمایش؛ زارەزارکردن؛ شین و شەپۆڕ کردن؛ کەوگریان؛ شین کردن؛ زۆڕەزۆڕ کردن:

**زارـزار گریه کردن**

**زار ـ زار گریه کردن** ☜ **زار زدن**

**زار** [2]: *صفت.* زار؛ ژار؛ نزار؛ زوێن؛ زوێر؛ زویر؛ زوار؛ لاواز؛ ناخۆش؛ خەمبار؛ کۆلیل؛ بێ‌گریک ‹حال زار: حاڵی زار›.

**ـــ زار** [3]: *پسوند.* ـــ زار؛ ـ سار؛ ـ جاڕ؛ ـ ئەڵان؛ ـ ڵان؛ شوێن یان ناوانێ کە لە شتێ، زۆری تێدایە ‹گلزار: گوڵزار›.

**زارت و زورت** / zārt-o-zûrt/: *اسم. [مستهجن]* گاڵە و گێڤە؛ شات و شووت؛ گەڤ و گوڕ؛ گەڤ و هەڕەشە؛ هەڕەشە و گوڕەشە؛ زیت؛ هۆگاڵە؛ هەرا و هەڕەشە؛ گاڵەگاڵی تێکەڵ بە هەڕەشە ‹مگر تو چکاره‌ای که این طور زارت و زورت می‌کنی؟: مەگەر تۆ کێی کە ئاوا گاڵە و گێڤە دەکەی؟›.

**زارع** / zāre' ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* وەرزیار؛ وەرزیەر؛ وەرزێر؛ وەرزێڕ؛ وەرزەوان؛ وەرزگەر؛ جووتیار؛ کێڵگەر؛ تووچێن؛ دەشتەوان؛ کەشاوەرز؛ کشتیار؛ هیتیار؛ هیتەوان؛ چێنەر؛ زارە؛ فەلا.

**زار و زندگی** / zār-o-zendegî/: *اسم. [مجازی، گفتاری]* ماڵ و ژیان؛ کەلپەل؛ دار و نەدار؛ دار و بەر؛ بژیوی؛ ژیوار؛ ئامیانی ژیان؛ بەرگی ژین؛ کەلوپەلی بە سەر بردنی ژیان ‹زار و زندگی همه را سیل برد: سێلاو ماڵ و ژیانی هەموانی برد›.

**زار و نزار** / zār-o-nazār/: *صفت.* زار و زوێن؛ زوێن؛ زار و نزار؛ نزار؛ زار و زوار؛ کز و کەنفت؛ لەڕ و لاواز؛ بێ‌گریک؛ ژار؛ نەخۆش؛ کز؛ کەمدار و بار ‹با حال زار و نزار روی تختخواب افتاده بود: بە حاڵێکی زار و زوینەوە لە سەر تەختەکە کەوتبوو›.

**زاری** / zārî ، ـها/: *اسم.* شین؛ زاری؛ ژاری؛ زمی؛ کرووز؛ کەوگری؛ زووکەزووک ‹تا صبح زاری می‌کرد: تا بەیانی شینی دەکرد›.

**زاریدن** / zārîdan/: *مصدر. لازم. [نامتداول]* زارین؛ زاریان؛ زمیهتن؛ زمین؛ کالین؛ زمایش؛ شین کردن؛ کەوگرین؛ ژاری کردن؛ زای کردن.

**زاغ** [1] / zāq/: *اسم.* ۱. ـها؛ ـان/ قەل؛ قەلەڕەشە؛ قەلەڕەش؛ قەلەڕەشکە؛ قالاو؛ قەلاسیلکە؛ قژاک؛ قلاژیلک؛ زاق؛ پەلەوەرێکی پڕ قیژ و قاژ، بە

جەستەی قاوەیی ئاماڵ چێرەیی، پەڕی شین و ڕەش و سپی بە شێوەی ڕێ-ڕێ لە سەر باڵ، جووتێ چاوی شین و کلکی ڕەشەوە ٢. زاخاو؛ بریقەی کانزا؛ ڕەنگی بریقەداری سەر کانزا ٣. شینتۆخ؛ ڕەنگی ئاوی پڕڕەنگ ٤. ☜ **زاج**

▣ **زاغ سیاه کسی را چوب زدن:** *[مجازی]* کەسێک دانە ژێر چاو؛ پا سەر کەسێ نان؛ کولەی کەسێ گرتن؛ چاو لە کەسێ دانەخستن؛ سەر دە دووی کەسێ نان؛ جێ پێ کەسێ هەڵگرتن؛ ڕەدوو کەوتنی کەسێ بێ ئەوەی بزانێ، بۆ سەردەرهێنان لە کاری ‹زاغ سیاهش را چوب زدم ببینم می‌خواهد کجا برود: دامە ژێر چاو، بزانم بۆ کوێ دەچێ›.

**زاغ** ²: *صفت.* شینتۆخ؛ شین؛ زاق؛ کەوگ؛ بە ڕەنگی ئاوی پڕڕەنگ ‹چشم زاغ: چاوی شینتۆخ›.

**زاغچه** / zāqče ، ـها/:*اسم.* قشقەڕە؛ قشقەلە؛ قەشقەل؛ قەل؛ قەلقشک؛ قەلقیشک؛ قەلەبەلەک؛ قەلانچە؛ قەلەزاژە؛ قەلەباچکە؛ قولەبازەلە؛ قورەباچکە؛ قاژ؛ قاژوو؛ قاقیشک؛ قرک؛ قژک؛ قژگە؛ قژاک؛ قژاکە؛ زاخێ؛ دوڤمەساسە؛ پەلەوەرێ لە تیرەی قەلان، بە جەستەی گچکە و ڕەنگی ڕەش-شینی پەرداخەوە کە نێر و مێی وەک یەک وایە.

**زاغک** / zāqak ، ـها/:*اسم.* گوراڵە مووساییانە؛ عەمرۆکە؛ قەلخورک؛ قالاوخوەر؛ نێوی چەند بنە گیای ئالیکی خۆڕسک و پایا، بە لاسکی ڕاست یان خزۆک، گەڵای تووکن، گوڵی زەرد، سوور یان نارنجیەوە.

**زاغ و زوغ** / zāq-o-zûq/:*اسم.[گفتاری]* ١. قیژ و واژ؛ قیژ و قاژ؛ زمی و ناڵە؛ زاق و زیق؛ زاق و زووق؛ زیق و واق؛ زیق و هۆڕ؛ زاک و زووک؛ زاک و زیک؛ زیڕەزیڕ؛ قیژەقیژ؛ چویرە ‹شب تا صبح زاغ و زوغ بچه نگذاشت بخوابم: شەو تا بەیان قیژ و واژی منداڵەکە نەیهێشت بنووم› ٢. *[کنایی]* زاڵە؛ سکاڵا؛ گلەی؛ گلەیی؛ گلە؛ منجەمنج ‹بین اگر بخواهی دایم زاغ و زوغ بکنی، معامله‌مان نمی‌شود: بڕوا ئەگەر بتەوێ هەر زاڵە بکەی، مامەڵەمان نابێ› ❋ **زاق و زوق**

**زاغه** / zāqe ، ـها/:*اسم.* کەوێڵ؛ کوول؛ کویل؛ زاخە؛ زاخ؛ زاخڕ؛ زاخۆن؛ زاخۆر؛ زاخوور؛ تەوخ؛ ڕەهۆڵ؛ سولتان؛ تەمووشە؛ گورە؛ ئەشکەوتی دەسکرد لە کێو، تەپۆلکە یان ڕەتیمدا کە بۆ هەڵگرتنی شتێ یان تێدا مانەوە هەڵیدەکۆڵن.

**زاغه‌نشین** / zāqenešîn ، ـها؛ ـان/: *صفت.* زاخەنشین؛ کەوێڵنشین: ١. دانیشتووی زاخە ٢. *[کنایی]* خاوەن ماڵ و لانەی هەژارانەی وەک زاخە.

**زاغی** / zāqî/:*اسم.* کلاغ زاغی ☜ **کلاغ**

**زاق و زوق** / zāq-o-zûq/ ☜ **زاغ و زوغ**

**زال** / zāl/: *صفت.* ١. زاڵ؛ کەژ؛ کەز؛ مووسپی؛ قژچەرموو؛ قژچەرمگ: **بور- بور** ٢. *[ادبی]* پیر؛ زورهان؛ دانسال؛ ساڵ‌لێ‌چوو؛ کەولەکۆن؛ بەساڵاچوو.

**زال‌تنی** / zāltanî/ ☜ **زالی**

**زالزالک** / zālzālak ، ـها/:*اسم.* گۆیژ؛ گویژ؛ گێوژ؛ کێوژ؛ گویج؛ گڤیر؛ گڤیژ؛ گڤیش؛ گووج؛ گوج؛ گووژ؛ گوژ؛ گوهیژ؛ گوهێژ؛ گهووژ؛ گیژ؛ گڤیشک؛ گوریج؛ گوویشک؛ گویشک؛ گوشک؛ گۆشک؛ گڤویشک؛ گهیشک؛ گوهیشک؛ گوهووشک؛ گومش؛ گوومش؛ گیچ؛ گێژۆک؛ گێژەلە؛ گوشک؛ بلچ؛ بلج؛ بلچی؛ بلت؛ بلەت؛ بلەتی؛ بەلەچ؛ تەنگیز؛ دیژەلە؛ ڕیلی: ١. دارچکێکی درکاوی بە گوڵی هێشوویی بچووک و سپی یان زەردی جوانەوە ٢. بەری ئەو دارە کە چکۆلە و خواردەمەنیە، ڕەنگی زەرد یان سوورە و پاییزان پێدەگا.

**زالو** / zālû ، ـها/:*اسم.* زارو؛ زالوو؛ زاڵوو؛ زەلوو؛ زەروو؛ زیرۆ؛ زیروو؛ زیڵوو؛ زالە؛ زالی؛ زالی؛ زیلی؛ زیری؛ شەلک؛ زووری؛ زۆرگ؛ زورک؛ مارمژ؛ کرمی گچکەی ئالقەیی کە زۆرتر دە

ئاوی شیریندا دەژی و بە یارمەتی ئەندامگەلی مژۆکیەوە دەزەلقێتە گیانلەبەران و خوێنیان هەڵدەمژێ.

**زالـی** / zālî /:اسم. کەژی؛ کەزی؛ زاڵی؛ مووچەرمگی؛ دیاردەیێ کە بە هۆی نەبوونی زکماکی ڕەنگدانەوە دەبێتە هۆی سپی بوونی موو، ڕۆشن و کاڵ بوونی ڕەنگی پێست و چاو: **زاڵ‌تنی؛ بوربوری**

**زامیاد** / zāmyād /:اسم. زامیاد: ١. فریشتەی بەرپرسی زەوی لە ئایینی زەردەشتیدا ٢. ناوی ڕۆژی بیست و هەشتمی مانگ لە ساڵی هەتاویدا.

**زان** / zān /: قید. [مخفف، ادبی] لەو؛ ژۆ؛ چا؛ لە ئەو ‹زان آتش اگرچه پر زنور است/ ایمن بود آن کسی که دور است: لەو ئاورە ئەرچی تین و نوورە/ بێ‌وەی ئەوەیە کە لێی بەدوورە›.

**زانو** / zānû ـها؛ زانوان/: اسم. ئەژنۆ؛ ئەژنوو؛ هەژنۆ؛ هژنێ؛ وژنێ؛ ژنۆ؛ ژەنوو؛ ژوونی؛ وژنگ؛ وژینگ؛ زانۆ؛ زانوو؛ زرانۆ؛ زانی؛ زرانی؛ زەنگۆڵ؛ هەنگۆڵ؛ چۆک؛ کورک؛ قچ؛ ورزنگ: ١. جمگەیێ لە پای مرۆڤدا، لە نێوان ئێسکی ڕان، کەشکەوژنگ (کلاوەژنۆ) و بەلەکدا، هەروەها ئەو بەشە لە پێ کە ئەژنۆش دەگرێتەوە ٢. جمگەی پێی چوارپێیان کە وەک ئەژنۆی مرۆیە ٣. جمگەی پاژنەیی لە پەلەوەراندا ٤. جمگەی نێوان ڕان و کلاوەژنۆ لە میرووانـدا ٥. بەشێ لە پاتۆڵ و شالوار کە سەر ئەژنۆ دادەگرێ ٦. ئانیشکە؛ تیکەیێکی چکۆلەی ناو بۆشی چەماوە بۆ لادانی ڕێگەی لوولە.

▣ **زانو انداختن:** سەر چۆک خستن؛ سەر زرانی دان؛ دەرپەڕینی سەر زرانی پانتۆڵ یان شەرواڵ بە هۆی زۆر لە بەرکردنەوە ‹آنقدر چهارزانو نشسته بودم که شلوارم زانو انداخته بود: ئەونده چوارمەشقێ دانیشتبووم پاتۆڵەکەم سەر چۆکی خستبوو›.

زانو به زانو نشستن: [کنایی] لووت بە لووت دانیشتن؛ چۆک بە چۆک دانیشتن؛ ئەژنۆ بە ئەژنۆ دانیشتن؛ دانیشتن بەرامبەر بە یەکتر و زۆر نێزیک بە یەک ‹چند ماه زانو به زانو می‌نشستیم و با هم بحث می‌کردیم: چەند مانگ لووت بە لووت دادەنیشتین و پێکەوە قسەمان دەکرد›.

زانو خم کردن: [کنایی] چۆک دادان؛ نیشتنە سەر چۆک؛ گلان؛ بەزین؛ بەزیان؛ کۆڵدان؛ شکست هێنان لە کار یان کێبەرکێیەکدا ‹در برابر حریفش زانو خم کرد: لە هەمبەر خەنیمەکەیەوە چۆکی دادا›.

زانو زدن: ١. چۆک دان؛ دانیشتە سەر زرانی؛ ئەژنۆ دانە سەر زەوی؛ زەنگۆڵەرە دەی؛ لە سەر چۆک دانیشتن ٢. [کنایی] چۆک دادان؛ هاتنە سەر چۆک؛ لە هەمبەر کەسێکدا بەیدەست بوون ‹همه در برابرش زانو زدند: هەموو لە بەرامبەریەوە چۆکیان دادا›.

زانوی غم در بغل گرفتن: دەستەو ئەژنۆ دانیشتن؛ پەنجە هەڵپێکان؛ زرانی خەم گرتنە باوەش؛ چنگزین؛ لە بەر خەم و پەژارە، نووشتاندنەوەی ئەژنۆ و هەڵپێکانی دەست بە دەوریدا و سەر نانە سەری ‹چه خبر است زانوی غم در بغل گرفته‌ای؟: چ قەوماوە، دەستەو ئەژنۆ دانیشتووی؟›.

بە زانو درآمدن: [کنایی] ١. چۆک دادان؛ نوشست هێنان؛ شکان؛ تێکشکان؛ بەزان؛ بەزیەی؛ بەزیای ‹ارتش آلمان سرانجام به زانو درآمد: سپای ئالمان ئاخری چوکی دادا› ٢. [ادبی] لە پا/ پێ‌کەوتن؛ لە پا کەفتن؛ ڕمیان؛ هێز و توان لێ‌بران ‹ناگهان به زانو درآمد و دیگر نتوانست برخیزد: لەنکاو لە پا کەوت و چیدی نەیتوانی هەڵسێتەوە›.

بە زانو درآوردن: [کنایی] چۆک پێدادان؛ شکست پێ‌دان و لە تەق‌ودوو خستن ‹بیماری

او را به زانو در آورد: **نه‌خۆشی چۆکی شکاند**›.

روی زانو نشاندن: له سه‌ر ئـه‌ژنۆ دانـان؛ نیانـه سه‌ر وژنـگ؛ لـه سـه‌ر چـۆک دانـان؛ سـه‌روو زه‌نگـۆڵاوه نیـه‌ی ‹بچـه را روی زانویـت بنـشان: منداڵه‌که له سه‌ر ئه‌ژنۆت دانێ›.

روی زانوی کـسی نشستن: لـه سـه‌ر ئـه‌ژنۆی که‌سێ دانیشتن؛ دانیـشتن لـه سـه‌ر چـۆکی که‌سێ؛ سـه‌روو زه‌نگۆڵـوو/ زه‌نگـۆڵاو یۆیـه‌وه نیشته‌یره ‹چهـار دسـت و پـا رفـت و روی زانـوی مادربزرگش نشست: بـه گاوڵـکێ ڕۆی و لـه سـه‌ر ئه‌ژنۆی ئاپیری دانیشت›.

**زانوئی** / zānû'î/ ☜ **زانویی**

**زانوبند** / zānûband ، ـها/:/سم. ئه‌ژنۆبـه‌ن؛ له‌تـه پارچه‌یه‌کی کێشی به‌نـدار یـا ئاڵـقه‌یی کـه بـۆ پاراستنی ئه‌ژنۆ له ئاست لێدان یان ده‌رچوونه‌وه پێوه‌وه‌ی ده‌به‌ستن.

**زانـویی** / zānûyî ، ـهـا/:/سم. زانـوو؛ ئانیـشکه؛ له‌ته‌یه‌کی بچووکی لووله‌یی هـه‌ڵۆڵ بـه سـیله‌ی جۆراوجۆره‌وه بۆ گۆڕانی بـاری لوولـه یـان لێـوه بوونی لووله‌یه‌کی‌تر و...: **زانوئی**

**زانـــــی** / zānî/: [عربـــی]/اســـم. [اســــلام] دامـــێن‌پـــیس؛ دامـــین‌تـــه‌ڕ؛ داوێـــن‌تـــه‌ڕ؛ داوێـن‌پـیس؛ شـواڵ‌چه‌پـه‌ڵ؛ زیناکـار؛ فلیتـه‌؛ پیاوێ که گانی حه‌رامی کردووه.

**زانیـــه** / zāniye/: [عربـی]/اسـم. [اسـلام] ژنی داوێن‌ته‌ڕ؛ ژنی زیناکار؛ ژنێ که گـانی حـه‌رامی داوه.

**زاویه** / zāviye ، ـها؛ زوایا/: [عربی]/اسم. سیله‌؛ سووچ؛ قـۆزی؛ گۆشـه‌؛ کـونج؛ قـوژبن؛ چمـک: ۱. خاڵێ که دوو یان چه‌ن ڕووپـه‌ڕ، هـێڵ یـان لێواره‌ی تێدا ده‌گه‌نه یه‌ک ۲. *[ریاضی]* به‌شـێک له لاپه‌ڕه که له چه‌رخانی نیـوه هێـڵێ بـه ده‌ور سـه‌ره‌تای خۆیـدا بـه‌دیهاتووه ۳. *[ریاضـی]* ئه‌ندازه‌ی هه‌راوی یان تـه‌نگی ئـه‌و شکـڵه یـان نزیکی و دووری ئه‌و دوو باڵه له یـه‌ک ٤. زێـوه؛ سووچی گۆڕستانی پیاوانی ئایینی و پیرۆزان که بینایه‌کیان بۆ کراوه‌ته‌وه.

◙ **زاویـه‌ی اتـاق**: کـاژێر؛ کوڵه‌سـووچ؛ قـوژبن؛ کونجی ماڵ؛ سووچی ئۆده.

**زاویه‌ی باز** ☜ **زاویه‌ی منفرجه**

**زاویه‌ی برجسته** ☜ **زاویه‌ی کوژ**

**زاویه‌ی برگشته** ☜ **زاویه‌ی کاو**

**زاویـه‌ی تکایـا**: کـاژێر؛ ئـۆده‌ی خه‌ڵـوه‌ت لـه ته‌کیه‌دا.

**زاویه‌ی تند** ☜ **زاویه‌ی حادّه**

**زاویه‌ی حاده**: گۆشـه‌ی تیـژ؛ گۆشـه‌/ سـیله‌/ سووچ/ کونجی ته‌نگ؛ سووچ/ سیله‌/ کـونجی تێژ؛ کونجی که‌متر له ۹۰ پله‌ک: **زاویه‌ی تند**

**زاویه‌ی کاو**: گۆشـه‌/ سـیله‌/ سـووچ/ کـونجی قـورپ؛ گۆشـه‌یێ لـه ۱۸۰ تـا ۳٦۰ پلـه‌ک: **زاویه‌ی برگشته؛ زاویه‌ی مقعر**

**زاویه‌ی کـوژ**: گۆشـه‌/ سـیله‌/ کـونجی کـۆم؛ گۆشه‌یێ له ۰ تا ۱۸۰ پله‌ک: **زاویه‌ی برجسته؛ زاویه‌ی محدّب**

**زاویه‌ی محدب** ☜ **زاویه‌ی کوژ**

**زاویه‌ی مقعّر** ☜ **زاویه‌ی کاو**

**زاویه‌ی منفرجه**: گۆشه‌ی بـاز؛ گۆشـه‌یه‌ک لـه نێوان ۹۰ و ۱۸۰ پله‌کدا: **زاویه‌ی باز**

**زاویه‌های متمم**: دوو گۆشـه‌ی وا کـه پێکـه‌وه ده‌بنه ۹۰ پله‌ک.

**زاویه‌های مکمل**: دوو گۆشه‌ی وا کـه پێکـه‌وه ده‌بنه ۱۸۰ پله‌ک.

**زاویه‌سـنج** / zāviyesanc/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **زاویه‌یاب**

**زاویه‌نشین** / zāviynešîn ، ـها/: [عربـی/ فارسـی] صفت. گۆشـه‌گیر؛ خه‌ڵـوه‌ت‌نـشین؛ پـشت لـه دنیاکردوو.

**زاویـه‌یـاب** / zāviyeyāb ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. گـۆش/ سـیله‌/ سـووچ/ کـونج‌پێـو؛ پـانتومیتر؛ که‌ره‌سـه‌ی ئه‌نـدازه‌گرتنی گۆشـه

کە لە نەخشە هەڵگرتن و هەڵسەنگاندنی زەویدا بە کار دێ: **زاویەسنج**

**زاهد** / zāhed ، ـها؛ ـان؛ زُهّاد/: [عربی]/اسم. تەرکەدنیا؛ هەبیس؛ هەریس؛ پارسا؛ خۆپارێز؛ تاییم؛ کەسێ کە بۆ نزیک بوونەوە لە خودا پارێزکاری گرتۆتە پێش.

**زایا** / zāyā/: صفت. [ادبی] بزۆک؛ زایا؛ زەڤۆک؛ زایێ؛ بە زگوزا؛ بە زاوزۆ؛ لێهاتوو لە زا و زێدا.

**زایائی** / zāyā'î/ ☜ **زایایی**

**زایاندن** / zāyāndan/: مصدر. متعدی. // **زایاندی:** زایاندت؛ **می‌زایانی:** دەزایێنی؛ **بزایان:** بزایێنە// زایاندن؛ زایانن؛ یاری کردنی دایک لە زاندا: **زایانیدن**. هەروەها: **زایاندنی**

■ صفت فاعلی: **زایاننده** [نامتداول] (زایێنەر)/ صفت مفعولی: **زایانده** (زایێنراو)/ مصدر منفی: **نَزایاندن** (نەزایاندن)

**زایانیدن** / zāyānîdan/ ☜ **زایاندن**

**زایایی** / zāyāyî/: اسم. زایایی؛ بزۆکی؛ زەڤۆکی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی بزۆک بوون: **زایائی**

**زاید** / zāyed ، ـها/: [عربی] صفت. زیادی؛ زێدە؛ نەپێویست ‹این لباسها زاید بودند: ئەم بەرگانە زیادی بوون›: **زائد**

▣ **زاید بر:** پتر لە؛ فرەتر لە؛ زۆرتر لە؛ فرەتەر جە؛ جیا لە ‹زاید بر نیاز: پتر لە نیاز›.

**زایدالوصف** / zāyedolvasf/: [عربی] صفت. لە قسە نەهاتوو؛ لە وتن نەهاتگ؛ سەرتر لە ڕادە و ئاستی دەربڕین و هەواڵ دان: **زائدالوصف**

**زایده** / zāyede ، ـها؛ زواید/: [عربی]/اسم. گرووز؛ لک؛ زێدە؛ زەقی یا دەرپەڕیوی، بەتایبەت لە ئەندام یا ئێسکدا: **زائده**

**زایر** / zāyer ، ـها؛ ـان؛ ـین؛ زُوار/: [عربی]/اسم. زیارەتکەر؛ زیارەتکار؛ ئەوی کە کەسێک یان جێگا و شوێنێک زیارەت دەکا: **زوار؛ زائر**

**زایرسرا** / zāyersarā ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. شوێنێ بۆ نیشتەجێ بوون و حەسانەوەی زیارەتکەران.

**زایش** / zāyeš/: اسم. زەها؛ زا؛ زاگ؛ زاوزوو؛ زاوزەو؛ زاوزۆ؛ زاوزێ؛ زەهاک (بۆ ئاژەڵ)؛ زەهەک (بۆ ئاژەڵ)؛ کار یان ڕەوتی زان.

**زایشگاه** / zāyešgāh ، ـها/: اسم. زایینگە؛ زێسانگە؛ نەخۆشخانە یان دەرمانگەی تایبەت بە زایینی ژنان.

**زایشی** / zāyešî/: صفت. زەهایی؛ زا و زۆیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە زاوزێ.

**زایل** / zāyel/: [عربی] صفت. نەماو؛ فەوتاو؛ نوقمەسار؛ هەڕشاو؛ ون بوو؛ لە ناوچوو: **زائل**

▣ زایل شدن: لە نێو چوون؛ لاچوون؛ ون بوون؛ بزر بوون؛ نەمان؛ شیایوە ‹بزودی لکەهای روی پوستش زایل شد: خێرا پەڵەکانی سەر پێستی لە نێو چوو›: هەروەها: **زایل کردن**

**زایمان** / zāyemān ، ـها/: اسم. زا؛ زەها؛ زۆمە؛ زان؛ زایەنە (ئاژەڵ)؛ زهە؛ کار یان ڕەوتی زایین.

**زاینده** / zāyande ، ـگان/: صفت. ١. [نامتداول] زاوزێکەر؛ بزۆک؛ زایا؛ زەڤۆک؛ زایێ؛ خاوەن توانایی و لێهاتوویی زایین ٢. زایندە؛ بە توانایی زێدە بوونەوە.

**-زایی** / zāyî/: پیوازه. — هێنی؛ - پێکهێنی؛ — بەدیهێنی؛ - زایی؛ - زێیی ‹گرمازایی: گەرماهێنی›: **زائی**

**زاییدن** / zāyîdan/: مصدر. متعدی. لازم. // **زاییدی:** زاییت؛ **می‌زایی:** دەزێی؛ **بِزا:** بزێ// □ متعدی. ١. دین؛ دیتن؛ دیەی؛ بوون؛ بیەی؛ بێچوو دیتن؛ زاولە دیەی؛ وینای؛ وە دیر هاوردن؛ زوەی خۆ هێنانە دونیا؛ بێچوو هێنان؛ منداڵ بوون ‹زنت پسر زایید: ژنەکەت کوڕی دیوە› □ لازم. ٢. زایین؛ زاین؛ زان؛ زەهان؛ زەهین؛ زهین؛ زەی؛ زای؛ زایش؛ زۆر بوون؛ فرە بوون ‹انگار پولهایت زاییده: چما پارەکانت زاون› ٣. زایەنە؛ لە بار بوونەوە ‹خرگوش دشوار زاید: کەرویشک ئاریشە دەزێ› ٤. بوون؛ لە دایک

بوون؛ بیەی؛ پەیدا بیەی؛ بە دنیا هاتن ‹برهنە زند ز مادر همه: هەموو بە ڕووتی لە دایکیان دەبن› ٥. *[مجازی، قدیمی]* زانەوە؛ زیەی؛ زیای؛ ڤەمزتن؛ هەلقولان؛ هەلقولیان؛ هەلقولتان؛ هەلقولتیان؛ هەلقولین؛ جۆشان؛ جۆشیان؛ دەردان؛ دانە دەر؛ تەقەی؛ تەقای؛ تەقینەوەی ئاو لە کانی و زۆنگدا: **زائیدن**. هەروەها: **زاییدنی**

■ **صفت فاعلی: زاینده** (ـِ)/ **صفت مفعولی: زاییده** (زاییگ)/ **مصدر منفی: نَزاییدن** (نەزایین)

**زَباد** / zabād/: [عربی]/*اسم*. زەباد: ١. /ـها/ گیانلەبەرێکی وەک پشیلەیە، بە پێستی خۆڵەمێشی ڕێ‌ڕێوە کە لە ژێر کلکیدا لکێکی هەیە و لەوێوە ماکێکی بۆنخۆش دەدەلێنێ لە عەترسازیدا بە کەلک دێ: **گربەی مشک** ٢. ناوی ئەو ماکە بۆنخۆشە.

**زُبالە** / zobāle ، ـها/: [عربی]/*اسم*. گوهوور؛ شەخەڵ؛ پاڵ؛ زبڵ؛ زبیل؛ زوێل؛ زرۆزبڵ؛ زوێل؛ کرس؛ خەوش‌وخاڵ؛ پڵ‌وپووش؛ خشت‌وخاڵ؛ خۆڵ‌وخاش؛ شتانی بێ‌بایەخ بۆ فڕەدان (وەک پاشماوەی پێخۆر، توێکڵی میوە، کاغەز دڕاوە و ئەوەی لە گەسک داندا کۆ دەبێتەوە).

**زُبالەبند** / zobāleband ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. زبڵ‌پێچ؛ دەزگا یا ماشینێ کە بە گوشاردان، بارستایی زبڵ کەم دەکاتەوە تا هەڵگرتن و جێبەجێ‌کردنی ساناتر بێت.

**زُبالەدان** / zobāledān ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. زبڵدان؛ زبڵگە؛ یاگەشەخەڵ: ١. دەفرێ یان شوێنێ کە زبڵی تێ‌دەڕژێنن ٢. زبڵدانی.

**زُبالەدانی** / zobāledānî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /*اسم*. زبڵدانی: ١. جێگایێ کە زبڵی لێ خڕ دەکەنەوە ٢. زبڵدان.

**زُبالەسوز** / zobālesûz ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. زبڵ‌سووتێن؛ کوورە یان کوانوویەک کە زبڵی تێدا دەسووتێنن.

**زُبالەکش** / zobālekeš ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. زبڵ‌کێش؛ کەرەسە یا دەم و دەزگای زبڵ و پاڵ گواستنەوە.

**زبان** / zabān ، ـها/: *اسم*. زمان؛ زوان؛ زبان؛ زوبان؛ هەزمان؛ ئەزمان؛ زۆ؛ زمـوون: ١. زان؛ زوخان؛ ئەندامی گۆشتنی بزۆز دە زاری زۆربەی بڕبڕەدارانـدا کـە لـە ناسینەوەی چێژەگەلی جۆراوجۆر، قووت دانی خۆراک و قسە کردن لـە مرۆدا، دەوری هەیە ٢. زوانی ئاژەڵی گۆشتی کە بە کولاوی دەیخۆن ‹ساندویچ زبان خوردیم: بابۆلەی زوانمان خوارد› ٣. *[مجازی]* هێز یا توانایی قسەکردن ‹مگر زبان نداری چرا حرف نمی‌زنی؟: مەگەر زمانت نیە بۆ قسە ناکەی؟› ٤. گەلالەیەکی سامانمەند لە مێشکی مرۆدا کە بە هۆی دەنگ و نیشانەگەلی نووسینی و بە گوێرەی بنەماگەلێکی پۆڕدراو، بەدی‌دێ و هۆی تێگەیشتن و تێگەیاندنە ‹ما همه به یک زبان صحبت می‌کنیم: ئێمە هەموو بە زمانێ قسە دەکەین› ٥. کۆمەڵە دروشم و نیشانەگەلێ کە لە بوار و بەستێنێکی تایبەت دە نێوان گرۆیەکدا بە کار دەڕوا ‹زبان حیوانات؛ زبان کامپیوتر: زمانی گیانەوەران؛ زمانی کەمپیوتەر› ٦. *[مجازی]* زمانی بیانی؛ زمانی نامۆ ‹آزاد زبان می‌خواند که برود خارج: ئازاد زمان دەخوێنێ کە بچێ بۆ هەندەران› ٧. *[گفتاری]* قسە؛ وتار ‹زبان ریختن: قسە ڕەقاندنەوە› ٨. *[مجازی]* زاراوە و شێوەی قسەکردن ‹زبان خوش: زمانی خۆش› ٩. جۆرێ نان شیرینی وەکوو زمان.

▣ **زبان ادبی**: زمانی وێژەیی؛ زمانی ئەدەبی؛ وشە و زاراوێ کە لە نووسینی زمانێک بەتایبەت لە نووسراوەی دابی و ئەدەبیدا بە کار دەچێ.

**زبان اشاره**: زمانی ئاماژە؛ زوانوو هەنارەی؛ کاری تێراگەیاندنی مەبەستی خۆ بە ئاماژە.

**زبان باردار**: زمانی بەبار؛ زمانی بارگرتوو؛ زوانی کەسێ کە لە بەر یاو یان کار ترازانی

گەدە، دائیساوە و ڕەنگی گۆڕاوە.

**زبان بی‌زبانی:** *[مجازی]* زمانی بێ‌زمانی؛ کار یان ڕەوتی دەربڕین و تێگەیاندنی مەبەستێ بێ ئەوەی بە ڕاشکاوی قسەی لێوە بکرێ.

**زبان بین‌المللی:** زمانی نێونەتەوەیی: ۱. زمانێ کە لە نێوان نەتەوەگەلی جۆراوجۆردا پەرەی سەندووە و بە زمانی یەکگرتووی جەهانی یان نێو نەتەوەیی ناوبانگی دەرکردووە و بە کار دەچێ (وەکوو فەرانسەیی لە ڕابردوودا و ئینگلیزی لە ئێستادا) ۲. *[کنایی]* زمانی ئاماژە.

**زبان تندوتیز:** *[مجازی]* زمانی ڕەش؛ زمانی شەڕ؛ زمانی تاڵ؛ دەمی پیس؛ قسەی ڕەق؛ قسەی تفت و تاڵ؛ قسەی شڕ و دڕ.

**زبان حال:** *[کنایی]* زمانی حاڵ؛ ئەو شتەی کە چلۆنایەتی و بار و دۆخی کەسێ یان شتێک دەردەبڕێ.

**زبان خوش:** *[مجازی، گفتاری]* زمانی خۆش؛ قسەی خۆش؛ زمانی شیرین؛ لفت و گفتی خۆش وێڕای دلۆڤانی.

**زبان رایانەای:** زمانی کەمپیوتەری؛ هەر کام لەو بەرنامانەی کە لە کۆمەڵە پیت، ژمارە، نیشانە و شێوەکارگەلێک پێکهاتوون و لە کەمپیوتەردا کارێکیان پێ ئەنجام دەدرێ.

**زبان رسمی:** زمانی ڕەسمی؛ زوانی فەرمی؛ زمانێ کە لە مەزرینگە و دام و دەزگا دەولەتیەکان و نووسراوەگەلی سەر بە دەولەتی هەر ولاتێک بە کار دەچێ.

**زبان زرگری:** زمانی زێڕنگەران؛ شێوە ئاخافتنێکی تایبەت کە لە گۆڕانی ڕاوێژ و جێبەجێ‌کرانی برگەگەلی زاراوەی تارانی لە ناو ڕیزی زێڕینگەراندا پێکهاتووە، بەم چەشنە کە دوای هەر پیتێک «ز»یەک زیاد دەکەن.

**زبان عامیانە:** زمانی کووجی و کۆڵان؛ زمانی خەڵکی؛ زاراوە و ئاخافتنی خەڵکی نەخوەنەوار.

**زبان کوچک:** بەلەزوانە؛ بەلەزمانە؛ ئەلەنگە؛ ئەلنگە؛ بەلوونکە؛ زمانۆک؛ زانک؛ زیل؛ زوانە چکۆلە؛ پارچە گۆشتێ گچکە لە بنی زمان و سەرەتای گەروودا.

**زبان مادری:** زگماکی؛ زمانی زکماک؛ زوانی مایێ؛ زمانی دایکی؛ زوانی ماری؛ زوانوو لەماوەردی؛ زمانێ کە مرۆڤ لە منداڵیەوە لە ڕێگای ئاخافتنی دایک و بابیەوە فێری دەبێ و بەو زمانە لەگەڵ هاوولاتیانیدا قسە دەکا.

**زبان مار:** درویشی؛ درێشوکی؛ درێشووکە؛ کالەگ؛ دریشووکەی مار.

**زبان محاورە:** زمانی وت‌ووێژ؛ وشە و زاراوەیەک کە لە وت‌وویژی نێوان جەماوەردا بە کار دەچێ.

▣ **زبان آدم سر کسی نشدن:** *[مجازی]* قسەی حیسابی بە گوێی کەسێکدا نەڕۆیشتن؛ بە هیچ زمانێ حالی نەبوون؛ زمانی بنیادەم بە سەری کەسێکدا نەچوون؛ لە قسەی بنیادەم حالی نەبوون؛ سەهەنە بوون؛ مل نەدان بە وت‌ووێژی ژیرانە و ڕێ نەدان بە قسەی ڕەوا ‹مگر زبان آدم سرت نمی‌شود: مەگەر قسەی حیسابت بە گوێدا ناڕوا›.

**زبان باز کردن:** *[مجازی]* زمان‌گرتن؛ زمان‌کرانەوە؛ زمان‌کردنەوە؛ زوان وەر بیەی؛ پەیدا کردنی هێز و توانایی قسەکردن ‹بچەاش تازە زبان باز کردە بود: منداڵەکەی تازە زمانی کرتبوو›.

**زبان بە دهان گرفتن:** *[گفتاری]* دەم وێستان؛ دەم لێک‌نان؛ زمان بەستن؛ وەروو دەمی گێرتەی؛ زوانەوە وراسەی؛ تاقەت هێنان و قسە نەکردن ‹یک دقیقە زبان بە دهان بگیر و بە حرفهای من گوش بدە: تاوێ دەمت بوەستێ و گوێ بگرە بۆ قسەکانم›.

زبان چرب و نرم داشتن:*[مجازی]* دەم‌تەڕ بوون؛ زمان‌لووس بوون؛ زمانباز بوون؛ زمان‌چەور بوون؛ خاوەن قسە و وتاری دۆستانە و میهرەبانانە هەبوون.

زبان خود را گاز گرفتن:*[کنایی]* بەر دەم خۆگرتن؛ زوانی خۆ گازگرتن؛ قەپ‌کردن بە زمانی خۆدا؛ زوانوو وێ ئەوەگەسەی؛ دەم لە قسە پاراستن ‹این حرفها چیست که می‌زنی؟ زبانت را گاز بگیر: ئەم قسانە چیە دەیکەی؟ بەر دەمت بگرە›.

زبان ریختن:*[مجازی]* دەم دان؛ دەم تەقنەی؛ قسە ڕەقاندنەوە؛ بۆ ڕازی‌کردنی کەسێک زۆر قسەکردن ‹یک ساعت برایش زبان ریختم: سەعاتێک دەمم دا بۆی›.

زبان سیمرغ برای کسی خواندن:*[مجازی]* قسەکردن بە نەرم و نیانی و زیرەکی لەگەڵ کەسێکدا بۆ ڕازی‌کردنی.

زبان کسی را بستن:*[مجازی]* دەم کەسێ بەستن؛ دەموو یۆی بینەی؛ قوڵف پێ کردن؛ قوڵف بە کەسێ کردن؛ هەلی قسەکردن لە کەسێ بڕین ‹حرفی زد که زبانم را بست: قسەیێکی کرد دەمی بەستم›.

زبان کسی را فهمیدن: لە زمانی کەسێ حالی بوون؛ لە قسەی کەسێ تێگەیین؛ تێگەیشتن لە مەبەستی کەسێک ‹باز تو زبان او را بهتر می‌فهمی: هێشتا تۆ لە زمانی ئەو باشتر حالی دەبی›.

زبان کسی را موش خوردن:*[تعریض]* زمان لە زار/ دەمی کەسێکدا نەبوون؛ بێ دەم وپل/ زمان بوون؛ حەپۆل مێش‌خۆر بوون؛ بێدەنگ بوون و قسە نەکردن لە کاتی پێویستدا ‹انگار زبانش را موش خورده بود: چما زوان لە زاریدا نەبوو›.

زبان کسی گرفتن:*[مجازی]* سەر زمانی کەسێ گرتن؛ زوانوو یۆی گێریایرە؛ تور بوون یا تووشی توری هاتن ‹زن خیلی خوبی است، ولی زبانش می‌گیرد: ژنێکی زۆر باشە، بەڵام سەر زمان دەگری›.

زبان کسی مو درآوردن:*[مجازی]* زمانی کەسێک کول بوون؛ دەم کەسێ داکەفتن؛ زمانی کەسێک موو دەرهێنان؛ زوانوو یۆی موو بەرئاردەی؛ بۆ بە دەست هێنانی ڕەزامەندی کەسێک، زۆر قسەکردن ‹بس که این حرف را گفتم، زبانم مو درآورد: هێندە ئەم قسەم کرد، زمانم کول بوو›.

از زبان کسی گفتن: لە زمانی کەسێکەوە وتن؛ لە قەوڵ کەسێکەوە قسەکردن؛ زوانوو یۆیەوە واتەی؛ وتەیەک لە لایەن کەسێکەوە دەربڕین ‹رفته از زبان من گفته که با عروسی مخالفم: چووە لە زمانی منەوە گوتوویە دژی زەماوەندم›.

به زبان آمدن:*[مجازی]* ۱. هاتنە قسە؛ هاتنە زمان؛ قسەکردن؛ ئامایوە زوان ‹ناگهان مار به زبان آمد و گفت...: لەنکاو مار هاتە قسە و گوتی...›. ۲. دەنگ دەرهاتن؛ هاتنە زمان/ زوان؛ ئامایوە دەنگێ؛ ناڕەزایی دەربڕین؛ بەرهەڵستی‌کردن ‹آن‌قدر اذیت کردی که بالاخره به زبان آمد: ئەوندە ئازاندت دەنگی دەرهات›. هەروەها: **به زبان آوردن**

به زبان کسی حرف زدن:*[مجازی]* ۱. لاسایی کەسێ کردنەوە؛ بە زوانوو یۆی قسەکەردەی؛ بە وشە و شێوەی کەسێک و وەک خۆی قسەکردن ۲. بەرامبەر بە بیر و ڕا یان سەلیقەی کەسێ قسەکردن.

**به سر زبانها افتادن** ☜ سر زبانها افتادن، سر[۳]

**زبان‌آموز** / zabānāmûz/:*[اسم]*. ۱. کەرەسە، بەتایبەت کتێبێ کە زمانێکی نامۆی پێ فێر دەبن ۲. خوێندکاری زمان؛ یا قوتابیەک کە خەریک فێر بوونی زمانێکە. هەروەها: **زبان‌آموزی**

**زبـــان‌آور** / zabānāvar ، ـان/: *صـفت. [مجـازی]* ده‌مه‌وه‌ر؛ ده‌ماوه‌ر؛ زمان‌ته‌ڕ؛ ده‌م‌پاراو؛ وتـه‌پاراو؛ قسه‌زان؛ قسه‌ڕه‌وان؛ زارشیرین؛ به ده‌م و زمـان؛ خـــاوه‌ن توانـــایی و هونـــه‌ری جـــوان و ڕازاوه قسه‌کردن.

**زبـــان‌آوری** / zabānāvarî/: *اســـم. [مجـــازی]* ده‌مه‌وه‌ری؛ ده‌ماوه‌ری؛ زمان‌پاراوی.

**زبانبــاز** / zabānbāz/: *صـفت.* دیلبـــاز؛ دیلبــان؛ زوانباز؛ زمانباز؛ زمان‌لووس؛ زمان‌ته‌ڕ؛ خولته‌که‌ر؛ زمان‌چه‌ور؛ لێهاتوو له قسه‌ی جوان و دڵخواز بـۆ به ده‌ست هێنانی دڵـی دیتـران بـه مه‌به‌سـتی گه‌یشتن به مرازی خۆ. هه‌روه‌ها: **زبانبازی**

**زبان‌بره** / zabānbarre/ ☜ **بارهَنگ ـ۱**

**زبان‌بسته** / zabānbaste ، ـها/: *صفت.* به‌سته‌زمان؛ به‌ســـه‌زوان: ۱. بـــێ‌ســـه‌ر و زوان؛ بـــێ‌زمـــان؛ زوان‌به‌ســـه؛ زمـــان‌به‌ســـراو؛ زوان‌به‌ســـیاگ؛ بـــێ‌ده‌م‌وپـــل؛ بـــێ‌ده‌م و دوو؛ بـــێ‌ده‌م و زوان؛ ده‌م‌سارد؛ تایبه‌تمه‌ندی ئه‌وه‌ی نه‌توانێ یان بۆی نـــه‌کرێ قـــسه بکـــات ۲. *[کنـــایی]* چه‌وســـاوه؛ زوڵم‌لێکراو؛ ده‌شه‌نی.

**زبان‌پریـشی** / zabānparîšî/: *اسـم. [روان‌شناسـی]* نه‌مان یان کز بوونی توانایی قـسه‌کردن پتـر بـه هۆی وه‌زه‌نێکی مێشکیه‌وه. هه‌روه‌ها: **زبان‌پریش**

**زبانچه** / zabānče/: *اسم.* زبان کوچک ☜ **زبان**

**زبانـدار** / zabāndār ، ـها؛ ـان/: *صفت. [کنـایی]* زمانـــدار؛ ده‌مـــدار: ۱. بـــه ده‌م و زوان؛ ســـه‌ر و زوانـدار؛ تایبه‌تمه‌نـدی ئـه‌وه‌ی بـه‌بێ تـرس و ڕووداشـــکان قـــسه‌ی خـــۆی ده‌کـــا ۲. ده‌م‌ڕاس؛ ده‌م‌ڕاســت؛ دم‌ڕاســت؛ ڕه‌وان‌بێــژ؛ ده‌ڤــخۆر لــه گه‌یاندنی مه‌به‌ستدا.

**زباندان** / zabāndān ، ـها؛ ـان/: *اسم.* زمـان‌زان؛ زوان‌زان؛ که‌سێ کـه یـه‌ک یـان چه‌نـد زمـانی بیانی ده‌زانێ. هه‌روه‌ها: **زباندانی**

**زبان‌درازی** / zabānderāzî ، ـها/: *اسم. [مجازی]* زمـــان‌درێـــژی؛ دڕدووکـــی؛ کـــار یـــان ڕه‌وتی خـــۆ تـــێ‌هه‌ڵقوڵـــتاندن؛ ده‌م لێـــدان؛ قـــسه‌کردن لـــه باره‌ی شتێکه‌وه که کاری بێژه‌ر نیـه. هـه‌روه‌ها: **زبان‌دراز**

**زبان‌درقفا** / zabāndarqafā ، ـها/: [فارسی/ عربـی] *اسم.* گوڵه‌ئاڵۆز؛ زوانه‌بووکه؛ گیایێکی یه‌ک ساڵـه یا هه‌میشه‌یی له تیره‌ی هه‌ڵالان، بـه هێـشووی پێچه‌ڵپێچی درێژ و بنه‌وش، سوور یان سـپیه‌وه: **دلفین**

**زبـــانزد** / zabānzad ، ـهـــا/: *اســـم. [مجـــازی]* سه‌رزاره‌کی؛ ڕسته یـان وشـه‌یه‌ک کـه لـه نێـو وێژه‌رانی زمانێک له بابه‌تێکی تایبه‌تـدا بـه کـار ده‌ڕوا و بیرکردنه‌وه‌ی ناوێ (وه‌ک ئـه‌وه که‌سـێک ئێژێ: «سه‌لام» ئه‌وی‌تر جـواب ده‌داتـه‌وه: «سـه‌لام سه‌ر چاو»).

**زبـانزد**[۲]: *صـفت. [مجـازی]* قـسه‌ی سـه‌ر زار؛ لـه سـه‌ر زمـانی خه‌ڵـک و بابـه‌تی قـسه و باسـی خه‌ڵک ‹داستان عـشق آنـان نقل مـردم شـهر بـود: باســـی ئـــه‌وینی ئـــه‌و دووه قسه‌ی سه‌ر زاری خه‌ڵکی شار بوو›.

**زبـــان‌شـــناختی** / zabānšenāxtî/: *صـــفت.* پێوه‌ندیدار یان هاوگه‌ری زمان‌ناسی.

**زبـان‌شـناس** / zabānšenās ، ـهـا؛ ـان/: *اسم.* زمان‌ناس؛ زوان‌ناس؛ زمانـه‌وان؛ که‌سـێ کـه لـه سه‌ر یه‌ک یان چه‌ند زمان، چییه‌تی، پێکهاتـه و گۆڕانکاریه‌کانی ده‌کۆڵێته‌وه.

**زبان‌شناسی** / zabānšenāsî/: *اسم.* زمـان‌ناسـی؛ زوان‌ناســی؛ زمانــه‌وانی؛ زانــستی لێکدانــه‌وه‌ی په‌یڤی مرۆڤ، که یه‌که‌گه‌ل، چییه‌تی، پێکهاته و گۆڕانی زمان ده‌گرێته‌وه.

**زبانـــک** / zabānak ، ـهـا/: *اسـم. [گیـاه‌شناسـی]* زمـانۆک: ۱. زیاده‌یـێ گچکـه لـه پێوه‌نگـای پانکه‌ڵه و چڵه ناسکه‌ی گه‌ڵا بـه لاسکی گیـاوه ۲. پووڵه‌کێکی گچکه له سه‌ر بنکی گه‌ڵای برێ گیـــاوه ۳. جامۆڵـــه‌ی وه‌ک زمـــانی بـــرێ گوڵووکگه‌ل.

**زبان‌گنجشک** / zabāngonceŝk, -goncešg ، ـها/:/اسم. بناو؛ بناڤ؛ بەناڤ؛ بەناو؛ وناو؛ بناوی؛ بناوەچ؛ بناوچ؛ وناوچ؛ زوانەمەلووچکە؛ زوانەمەلیچک؛ دارێکی چێوی پایا لە تیرەی زەیتوون بە گوڵی بێ‌کاسە و جام کە بەر لە گەڵا کردن دەپشکون، چرۆی ڕەشی کوڵکنە و گەڵای شانەیی یان ڕووبەڕوو، بەری وشکی توێکڵدار و ناوکەی ڕۆندارە و بۆ بۆنخۆش‌کردنی برێ نۆشابە بە کار دەچێ.

**زبان‌نفهم** / zabān.nafahm ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* تێنەگەیشتوو؛ ناحاڵی: ١. لە زمان حاڵی نەبوو؛ لە قسە تێنەگەییو؛ تایبەتمەندی کەسێ کە لە قسەی خەڵک تێ‌ناگا ٢. *[کنایی]* گوێلەق؛ گوێ‌شۆڕ؛ گۆهشۆڕ؛ دەبەنگ.

**زبانە** / zabāne ، ـها/:/اسم. ١. زوانە؛ زمانە؛ دەرپەڕیویەکی وەک زمان لە شتێکدا ‹زبانەی قفل: زوانەی قولف› ٢. سک داویەکی بەرتەسک لە گڵ و ماسە لە ناو کەنداودا.

◙ زبانەی آتش: گوڕ؛ گوڵ؛ گوڕی؛ گڕە؛ گڕناوڕ؛ گڕپە؛ کلپە؛ کلە؛ کللی؛ پەهت؛ پێت؛ بلێسە؛ بلووزە؛ زمانە؛ تلەتڵ؛ ڕڤین؛ ڕمی؛ مەفشەڵ؛ گڕی هەڵچووی ئاگر.

زبانەی خورشیدی: بلێسەی هەتاوی؛ تەقینەوەگەلێکی کورت و زۆر بەتین بە شێوەی مەلبەندگەلێکی درەوشاوە لە ڕەنگین گۆی تاودا.

زبانەی سگک: کوڕەک؛ زمانەی ئاڵقە زوونە.

زبانەی قفل: زمانەی قوفڵ؛ زوانەی قولف؛ دوورک (بۆ قوفڵی دارین)؛ پەلی دەرپەڕیوی قوفڵ کە بە کلیل دەکرێتەوە و دەبەسترێ.

◘ زبانه کشیدن: بلێسە دان؛ هەڵپشکووتن؛ کلپە سەندن؛ گوڕی‌دان؛ گڕ پێکەی؛ خوار و بان‌کردنی گڕ ‹آتش درون بخاری زبانه می‌کشید: ئاگری ناو سۆبەکە بلێسەی دەدا›.

**زبانی** / zabānî/: *صفت.* زمانی؛ زوانی: ١. پێوەندیدار بە زمانەوە ٢. دەڤکی؛ دەمی؛ زارەکی؛ بە دەم وتراو ٣. *[مجازی]* سەرزارەکی؛ سەرزاری؛ گووپی؛ بەبێ هاوڕێیی لەگەڵ کرداردا ‹دوستی زبانی: دۆستی زمانی›.

**زبانیار** / zabānyār ، ـها؛ ـان/:/اسم. زمانیار؛ ئەوی کەبۆ فێرکردنی قسە بەبێ دەم و دوان ڕاهاتووە و لەم کارەدا لێهاتوویی هەیە.

**زبانیاری** / zabānyārî/:/اسم. زمانیاری؛ فێرکاری زمان؛ زانست یان شێوەی فێرکردنی پەیڤین بەو کەسانەی کە لە قسەکردندا کەم و کووڕییان هەیە.

**زبده** / zobde ، ـها؛ ـگان/: [عربی] *صفت.* هەڵبژارتوو؛ هەڵبژاردوو؛ هەڵبژارتە؛ هەڵبژاردە؛ لێهاتوو؛ ژێهاتی؛ لەبار؛ هەڵکەوتوو؛ خاوەن تایبەتمەندی گرینگ و بەرچاو ‹زبدەی مخلوقات: هەڵبژارتووی ئافرێنراوان›.

**زبر** / zebar, zabar/:/اسم. سەر؛ سەرە: ١. نیشانەیەکی بزاوی لە شێوە نووسینی فارسی و عەرەبیدا کە بکەوێتە سەری هەر پیتێک، دەنگی «ە» یان «ـە»ی پێ‌دەدا ٢. *[ادبی]* بان؛ زت؛ ڕووی هەر شتێک ‹زبر خاک: بانی خاک›.

**زبر** / zebr/: *صفت.* زبر؛ زرو؛ زڤر؛ زبرە؛ زروە؛ زرب؛ زرف؛ زوور؛ زوڤر؛ زەور؛ زوفت؛ زێر؛ گڕ؛ گرناڵ؛ گرنۆر؛ گرنج؛ قورنج؛ گەرووز؛ گرس؛ گرژ؛ گزم؛ درشت؛ دشت؛ ڕووش؛ ڕووشە؛ قەرت؛ خێخ؛ گوژم؛ بە ڕوویێکی ناساف و چاڵ و بەرزی ورد و سفتیەوە. بەرانبەر: **نرم** ‹پوست زبر: پێستی زبر›.

**زبرا** / zebrā/: [انگلیسی از ایتالیایی] ☜ **گورآسب**

**زبرجد** / zebarcad/: [عربی]/اسم. یاقووتی‌زەردە؛ بەردێ لە ئلیوین بە مەنیەزیوم یا مەنیەزیوم و ئاسنەوە، بە ڕەنگی قاوەیی و سەوز کە لە گەوهەرسازیدا بە کار دێ.

**زبردست** / zebardast,zabar- ، ـان/: *صفت. [ادبی]* ۱. بالادەست؛ بالادەس؛ زۆردەست؛ دەسەلاتدار؛ زت؛ خاوەن هێز و گوڕی زۆرتر ‹ای زبردست زیردست آزار: ئەی بالادەستی ژێردەدەست چەوسێن› ۲. دەستهەل؛ چنگە؛ مامۆستا؛ لێهاتوو؛ لێزان؛ کارامە ‹ناطق زبردست: بێژەری لێهاتوو›. هەروەها: **زبردستی**

**زبر و زرنگ** / zebr-o-zerang ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* زبت و زرەنگ؛ زرت و زرینگ؛ زرک و زینگ؛ کرژ و کۆڵ؛ گورج و گۆڵ؛ چوست و مەزبووت؛ وت و وریا؛ زیتەڵ؛ زیتەڵە؛ تروسک؛ چەلەنگ؛ گوربز؛ بە دەست و برد ‹کارگر زبر و زرنگ: کرێکاری زبت و زرەنگ›.

**زبره** / zebre/: *اسم.* زروە؛ زوروە؛ قرتیل (بۆ دانەوێڵە)؛ ئەوەی لە بەر سفتی و ورد نەبون هێلەک دایناداو تێیدا دەمێنێتەوە. بەرانبەر: **نرمه**

**زبری** / zebrî ، ـها/: *اسم.* زبری؛ زروی؛ زرویی؛ گرنالی؛ نارێکی لە ڕوویەکدا. بەرانبەر: **نرمی**

**زبل** / zebel ، ـها/: [از عربی] *صفت. [تعریض، گفتاری]* سەگانی؛ سەگ؛ زۆرزان؛ فرەزان؛ گزەون؛ زیرەک؛ فێڵباز؛ زۆڵ ‹این رفیق تو خیلی زبل است، همەمان را گول زد: ئەم ڕەفیقەت یەکجار سەگە، هەموومانی فریو دا›.

**زبون** / zabûn/: *صفت. [ادبی]* زوێن؛ زەبوون: ۱. بەزیو و تەزیو لە درێژەدانی ملە ۲. پەست؛ خوار؛ کورە؛ کوورە؛ ئابڕووتکاو؛ ئابڕوونەماو ۳. داماو؛ دەسەوەستان؛ دەسەپاچە؛ بێدەسەلات؛ کز و لاواز. هەروەها: **زبونی**

**زپرتی** / zepertî ، ـها/: *صفت. [تعریض، گفتاری]* ۱. کەمبایەخ ‹کتاب زپرتی: کتێبی کەمبایەخ› ۲. شەقوشڕ؛ سس؛ سست ‹خانەی زپرتی: ماڵی شەقوشڕ› ۳. بێهێز؛ کز؛ لاواز؛ لەجەر؛ زەپرتی ‹پیرزن زپرتی: پیرەژنی بێهێز› ٤. شلوشۆل؛ شلەپەتێ؛ ئەوەی بەرگەی گوشار ناگرێ ‹پارچەی زپرتی: قوماشی شل و شۆل›: **فزرتی**

**زجاجیه** / zocācîyye/: [عربی] *اسم.* تراوێکی ڕوون و لینجە کە زۆرترین بەشی گۆی چاو لە پشتەوەی گلێنە پڕ دەکاتەوە.

**زجر** / zacr/: [عربی] *اسم.* ئازار؛ ئێش؛ ئەشکەنجە؛ جەزر؛ ناراو؛ زووخاو.

◘ زجر دادن: زووخاو پێدان؛ زووخاوەسک کردن؛ ئازار دان؛ جەزرەوە دان؛ زەجر پێدان؛ ئەشکەنجە دان؛ ناراو دان؛ ناراو پێهەڵێنان؛ ڕەنج دان؛ ئازراندن؛ ئاراندن؛ ئەرناندن؛ بنپەنج کرن؛ تەرپلاندن؛ کەڤاندن؛ دەوساندن؛ دەسنین ‹اینقدر مادرت را زجر نده: ئەمەندە زووخاو مەدە بە دایکت›.

زجر دیدن: ئازار دیتن؛ ئەشکەنجە دیتن؛ جەزرەوە دیتن؛ زووخاو چوونە سک؛ ناراو دیتن؛ کەوتنە بەر ئازار دان؛ ڕەنج دیتن ‹دە سال زجر دیدم و دم بر نیاوردم: دە ساڵ ئازارم دی و دەنگم دەرنەهات›.

زجر کشیدن: ئازارکێشان؛ ئەشکەنجە کێشان؛ زەجرکێشان؛ ڕەنجکێشان؛ زووخاو چێشتن.

**زجرآور** / zacrāvar/: [عربی/ فارسی] *صفت.* پڕ لە زووخاو؛ پرجەزرەبە؛ پڕئازار؛ ئازاردەر؛ هۆی ئەشکەنجە و ئازار ‹زندگی زجرآوری داشتم: ژیانێکی پر لە زووخاوم هەبوو›.

**زجردیده** / zacrdîde/: [عربی/ فارسی] *صفت.* چەوساوە؛ ئازاردیتوو؛ زەجردیتوو؛ ئەشکەنجەدیتوو؛ تەملە.

**زجرکش** / zacrkeš/: [عربی/ فارسی] *صفت.* زەجرکێش؛ تووشیاری ئەشکەنجە و دەرد و ئازاری زۆر.

**زجرکش** / zacrkoš/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ئازارکوژ؛ کوژراو بە هۆی شکەنجە و ئازارەوە.

◘ زجرکش کردن: ئازارکوژکردن؛ بە ئەشکەنجە و جەزرەبە دان کەسێ کوشتن ‹او را زجرکش کرده بودند: ئازارکوژیان کردبوو›.

**زحاف** / zehāf/: [عربی] *اسم. [ادبی]* شێوازێکی گۆڕان لە کێشی شیعری عەرووزیدا (بەحر) کە بە لابردنی یەک یان چەند پیت کێشێکی تازە بەدیدێت، وەک «مُستَفعِلُن» ببێتە «مُفتَعِلُن».

**زحل** / zohal/: [عربی] *اسم.* کەیوان؛ ئاستان؛ دووهەمین گەڕۆکی گەورەی کۆمەڵەی هەتاوی دوای موشتەری و شەشەمین گەڕۆک لە باری دووری لە خۆرەوە، کە بە چاو دەبینرێ و ئاخڵەیێک دەورەی داوە: **کیوان**

**زحم** / zohm/: [عربی] ☜ **زُهم**

**زحمات** / zahamāt/: [عربی] جمعِ ☜ **زَحمَت**

**زحمت** / zahmat ، ـها؛ زَحَمات/: [عربی] *اسم.* زەحمەت: ١. زامەت؛ ئەمەک؛ ئەرک؛ ڕەنج و ئەرک ‹زحمت زندگی: زەحمەتی ژیان› ٢. سەخڵەت؛ کاری دژوار ‹ساختن خانه خیلی زحمت داشت: کردنەوەی ماڵ زۆر زەحمەت بوو›.

▣ زحمت زیاد: گوپچڕ؛ دەردیسەر؛ ناری عەلی؛ زۆر بە دژواری ‹با زحمت زیاد بدهی را ازش گرفتم: بە هەر گوپچڕێ بوو قەرزەکەم لێساندەوە›.

▣ زحمت دادن: زەحمەت دان؛ زامەت دای؛ دەردیسەر دان؛ ڕەنج پێدان؛ ئەزیەت دان؛ چەوساندن؛ کاری دژوار بە کەسێک داسەپاندن.

زحمت کشیدن: زەحمەتکێشان: ١. ڕەنج دان؛ ڕەنجکێشتەی؛ ئەرکی گران جێبەجێ کردن؛ کراندن؛ ئەرککێشان؛ کەفتەدان؛ چەوسانەوە ‹برایش خیلی زحمت کشید: زۆر زەحمەتی بۆ کێشا› ٢. مەینەت کێشان؛ کەفتنە زەحمەت؛ کارێکی سەختکردن ‹زحمت کشیدید، این همه راه را برای دیدن ما تشریف آوردید: زەحمەتتان کێشا، بۆ دیتنی ئێمە ئەو هەموو ڕێگەیە هاتن›.

زحمت کم کردن: *[مجازی]* لە کۆڵ بوونەوە؛ زەحمەت کەم کردن؛ کردنە بەهەشت؛ لە لا یان لە ماڵی کەسێک چوون ‹اگر اجازه بفرمایید دیگر زحمت کم می‌کنیم: ئەگەر ئیجازە بەن با ئیتر لە کول بینەوە›.

**زحمتکش** / zahmatkeš ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* زەحمەتکێش؛ زەحمەتکیش: ١. ڕەنجدەر؛ ڕەنجبەر؛ ئەرکدەر؛ بارگران؛ بارقورس؛ هەڵگری ڕەنج و سەختی لە کاردا ٢. ناندۆز؛ خاوەن پیشەی سەخت و پڕ دەردیسەر.

**زخارف** / zaxāref/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ١. سڵسڵە و پڵپڵە؛ سسلەوپپلە؛ هەر شتێکی گرانبایی و ڕەنگاوڕەنگ ٢. خشڵ؛ زێڕ و زەنبەر؛ ڕەوش.

▣ زخارف دنیوی: ١. زێڕ و زیوی دنیا ٢. زەرق و بەرقی ژیان.

**زخم** / zaxm ، ـها/: *اسم.* زەخم؛ زام؛ زیەم: ١. برین؛ زەخمەل؛ کولک؛ چوێ؛ نژد؛ ڕیش؛ گەزندێ کە بە پێست دەگا ٢. ئالگ؛ زەخمەل؛ چوێ؛ نژد؛ ڕیش؛ کوان؛ چاک و قاژێ کە لە جێگایەکی لەشدا پەیدا دەبێ و چڵک یان خوێنی لێوە دێ ٣. *[مجازی]* گەزەنی ڕۆحی و هەستی ‹زخم زبان: زەحمی زار› ٤. ڕووشێ کە لە سەر شتێکەوە بەدیبێ.

▣ زخم بستر: برینی ناوجێ؛ زامی سەرجێ؛ زامێ کە لە بەر هەلاژیانی زۆری بڕێ نەخۆشان، زۆرتر لە پشتیاندا بەدیدێ.

زخم تازه: گەرمەبرین؛ تازەبرین؛ برینێ کە هێشتا سارد نەبۆتەوە و خوێنی لێدێ.

زخم چرکین: دوژەدەر؛ زامێ کە کیم و هەوای هەیە.

زخم زبان: *[مجازی]* پلار؛ زیپک؛ شاتاڵ؛ شاتاوڵ؛ تانە و تەشەر؛ لارە؛ قسەی تاڵ و ناخۆش.

زخم کاری: *[کنایی]* برینی کاری؛ زامی قووڵ؛ برینی تیژ؛ زامێ کە ببێتە هۆی مەترسی فەوتان و لە نێو چوونی کەسێک یان

گیانەوەرێک.

**زخم معده:** قورعە؛ قورحە؛ برینێ لە ناو گەدەدا کە بە هۆی شێوانی گەڕیانی خوێن لە دیوارەیدا، هاندرانی دەماری سەمپاتیک، زۆر بوونی تەوش و ترشی گەدە یان کرژ بوونەوەی ماسوولەکانی گەدە بەدی دێ.

▣ **زخم برداشتن:** زەخمی بوون؛ زامار بوون؛ بریندار بوون؛ بە هۆی کوتران یان گەزەنەوە زامار بوون.

**زخم بستن** ☜ **زخم‌بندی**

**زخم بودن:** زەخم بوون؛ بریندار بوون؛ زام بیەی؛ خاوەن گەزندێ چلکین یان خوێنین بوون. هەروەها: **زخم شدن**

**زخم زدن:** بریندارکردن؛ زامدارکرن؛ زەخمی کردن؛ ڕیشدارکردن؛ چوێدار کردن.

**زخم کردن:** بریندارکردن؛ کردنە زەخم؛ ئازار گەیاندن بە پێست و چینی ژێر پێست.

**بە زخم کاری زدن:** *[مجازی]* کەلێنێک/ کەلەبرێک/ کەل و کونێکی پێ پڕکردنەوە؛ دانە تەمووی زامێکدا؛ کونێکی پێ گرتن؛ ولەکەلەکێو پنەگێرتەی؛ کەلک وەرگرتن لە شتێ بۆ کارێ ‹اگر آن پول زودتر می‌رسید به زخم کاری می‌زدم: گەر ئەو پارە زووتر بگەیشتایە، کەلێنێکم پێ‌پر دەکردەوە›.

**زخم‌بندی** / zaxmbandî ، ـها/: *اسم.* برین‌پێچی؛ زامبەندی؛ کار یان ڕەوتی بەستنی زەخم، بەتایبەت ڕەوتی خاوێن‌کردنەوە، دەوا لێدان و داپۆشینی برین بە برین‌پێچ.

**زخم‌وزیلی** / zaxm-o-zîlî/: *صفت. [گفتاری]* بریندار؛ زامار؛ پرزام؛ پڕ لە برین، ڕووش یان شوێنی کوتان ‹شب با دست و پای زخم‌وزیلی برگشت: شەو بە دەس و پێی بریندارەوە هاتەوە›.

**زخمە** / zaxme ، ـها/: *اسم. [ادبی]* پێژەن؛ زەخمە؛ دەنووکە؛ میزراب؛ ئەو شتەی ژێی دیوان و تار و... پێ‌دەژەنن.

**زخمی**[1] / zaxmî ، ـها؛ ـان/: *اسم.* بریندار؛ ڕیشدار؛ زامدار؛ زامار؛ زیەمدار؛ کولدار؛ کەسێ کە گەزەنی پێ‌گەیشتووە و بریندار بووە ‹زخمی را به درمانگاه بردیم: بریندارەکەمان بردە دەرمانگا›.

**زخمی**[2]: *صفت.* بریندار: ۱. زامدار؛ زامار؛ زیەمدار؛ کولدار؛ ڕیشدار؛ چوێدار؛ زەخموو ‹دستم زخمی شد: دەسم زامار بوو› ۲. ڕووش؛ ڕووشدار؛ بە ڕوویەکی کراوە و گەزەن دیتووەوە ‹مواظب جعبەی تلویزیون باشید، موقع جابجا کردن زخمی نشود: وریای جەعبەی تەلەڤیزیۆنەکە بن، لە جێبەجێ‌کردندا ڕووش هەڵنەگرێ›.

**زخیدن** / zaxîdan/: *مصدر. لازم. [قدیمی]* ۱. نالاندن؛ نالانن؛ نالان؛ ناڵین؛ نالەی؛ نالای؛ نالایش؛ نالەنە؛ نالەکردن ۲. نقاندن؛ نقان؛ نقەی؛ نقای؛ خۆ ڕێک‌کوشین و زۆرکردن بەتایبەت لە کاتی ڕیاندا.

**زد**[1]ـ / zad/: *پیشوازە.* کوتان؛ لێدان؛ مالین ‹زد و خورد: کوتان و خواردن›.

**ـزد**[2] / zad/: *پیوازە.* ـ دێر؛ ـگەز؛ ـگاز؛ ـکەوت ‹نامزد: ناودێر›.

**ـزدا** / zedā/: *پیوازە.* ـلابەر؛ ـ سرێن؛ ـ سەڕ؛ سڕەوە ‹چرک‌زدا؛ رنگ‌زدا: چلک‌لابەر؛ ڕەنگ‌سرێن›.

**ـزدائی** / zedā'î/ ☜ **ـزدایی**

**ـزدایی** / zedāyî/: *پیوازە.* ـ سڕی؛ مالەفە؛ کار یان ڕەوتی سڕینەوە؛ خاوێن‌کردنەوە ‹رنگ‌زدایی: ڕەنگ‌سڕی›: **ـزدائی**

**زدگی**[1] / zadegî ، ـها/: *اسم.* کەلی؛ زەدەداری؛ گۆسپەیی؛ ڕوکیاگی؛ کرپاوی؛ ڕووکە یا دڕاویەکی چکۆلە لە سەر شتێ کە زۆرتر بە هۆی کوتیان یان سووانەوە پەیدا دەبێ ‹میز از دو جا زدگی داشت: مێزەکە لە دوو لاوە کەلی هەبوو›.

**ـزدگی**[2]: *پیوازە.* ـ لێداوی؛ ـ بردوویی؛ ـ ئانگازی؛ ـ ئەنگازی؛ ـ ئەنگەزی؛ ـ گەزی؛ ـ ئاژۆیی؛ ـ ئارۆیی؛ ـ بردەیی؛ ـ بردگی؛ ـ بەردەیێ؛ ـ لێکەوتوویی؛ ئازار دیتن یان

کەوتنە بەر تەوژمی شتێکەوە و گەزەن پێگەیشتن ‹آفتاب‌زدگی؛ گرمازدگی؛ سرمازدگی: تاوبردن؛ گەرمە بردن؛ سەرما بردن›.

زدن / zadan/: *مصدر. متعدی. لازم.* // **زدی:** لێتدا؛ **می‌زنی:** لێدەدەی؛ **بِزن:** لێدە// □ *متعدی.* ۱. لێدان؛ لێیان؛ کوتان؛ کوتاندن؛ کەوتاندن؛ پێداکێشان؛ پیاکێشان؛ پیامالین؛ هەرشاندن؛ ئەلی‌داین؛ کوەی؛ کوای؛ پێدامالین؛ پۆرەکێشەی؛ پۆرەمالەی؛ بە هێز و گوشارەوە شتێ بە شوێنێکدا کوتان ‹کاسه را به سنگ زدن: بایە لە بەرد دان› ۲. لێدان؛ کوتان؛ کوتاندن؛ وەشاندن؛ تێسرەواندن؛ تێسرەوانن؛ کوای؛ ئەلی‌داین؛ وەنەدای؛ ئەنەدای؛ گەمشاندن؛ قوتان؛ تاشاندن؛ پورانن؛ ترپانن؛ داین؛ ئەت‌کردن؛ ژەنن؛ کوشتەی؛ دەلای؛ شەنەی؛ شانەی؛ شای؛ خستنە بەر لێدانەوە ‹کتک زدن: کوتەک لێدان› ۳. پێکان؛ لێدان؛ ئەنگاوتن؛ ئەنگافتن؛ کوتاندن؛ پێداکێشان؛ پیاکێشان؛ پێدامالین؛ ئەلی‌داین؛ پێکەی؛ پێکای؛ کەسێ یان شتێک کەوتنە بەر سەگمانەوە ‹شکارچی دو تا پرنده را زد: ڕاوچی دوو پەلەوەری پێکا› ٤. بڕین؛ بڕیەی؛ ڕنینەوە؛ درووێنەکردن یان کورت‌کردنەوە ‹چمن را زدن: چیمەن بڕین› ٥. لێدان؛ ئەلی‌داین؛ زنگین؛ وەنەدای؛ ئەنەدای؛ داینە؛ دەنگ لە شتێکەوە دەرهێنان ‹زنگ را زدن: زەنگ لێدان› ٦. دان؛ لێدان؛ هەڵواسین؛ ئاوێزان‌کردن؛ ئەرەکەردەی؛ ئەرەئاڵۆچنەی؛ ئاڵۆچنایرە؛ وەنەدای؛ داونەی؛ دارەڵۆزکردن ‹کراوات زدن؛ به میخ زدن: کەراوات لێدان؛ لێدان بە بزماردا› ۷. داکوتان؛ داکوتاندن؛ لێدان؛ ئەرەکوەی؛ کوایرە؛ شتێ لە شوێنێکدا دامەزراندن ‹چادر را زیر سایه‌ی درختها زدیم: چادرەکەمان لە بن سێبەری دارەکاندا داکوتا› ۸. کردن؛ دان؛ کەردەی؛ لە شوێنێک لە حەقی کەسێ یان شتێکدا کارێک‌کردن ‹با کسی حرف زدن: لەگەڵ کەسێکدا قسەکردن› ۹. کوتان؛ لێدان؛ دژ بە کەسێ کارکردن ‹برای کسی زدن: بۆ کەسێک کوتان› ۱۰. بڕین؛ بڕیەی؛ دزی‌کردن؛ چەپاوکردن؛ لە شوێنێ دزی‌کردن ‹بانک را زدن: بانک بڕین› ۱۱. *[مجازی]* چارکردن؛ دەرەقەت هاتن؛ سەرکەوتن؛ یارەی؛ ئەوەپێکنەی؛ درۆست هاتن ‹او همه‌شان را می‌زند: چاری هەموویان دەکا› ۱۲. لێدان؛ ساوین؛ سوون؛ ساوەی؛ ساوای؛ هەنوون؛ مالەی؛ مالای؛ پێداساوین؛ وەنەدای؛ ئەنەدای؛ شتێ مالین ‹دوا زدن: دەوا لێدان› ۱۳. *[مجازی]* دان؛ لێدان؛ بردن؛ بەردەی؛ ئازارگەیاندن بە شتێک ‹دل را زدن: دان لە دڵ› ١٤. *[مجازی]* لێدان؛ گرتن؛ تێگرتن؛ ئەنەگێرتەی؛ وەنەگێرتەی؛ وەنەدای؛ ئەنەدای؛ کەسێ یان شتێک خستنە بەر کارێکەوە ‹تهمت زدن: تۆمەت لێدان› ۱٥. کردن؛ پێوەکردن؛ تێکردن؛ ئەنەکەردەی؛ کەردەینە؛ شتێک زیادکردن ‹نمک زدن: خوێ‌کردن› ١٦. لێدان؛ کوتان؛ وەنەدای؛ ئەنەدای؛ بە ئامێرێ شێلگیرانە کارکردن ‹پا زدن: پێ لێدان› ۱۷. دان؛ کوتان؛ خستن؛ دای؛ داونەی؛ ئەنەدای؛ بە هەشتاو خۆ بە شوێنێ گەیاندن (زۆرتر بە شوێنێکی باز) ‹به آب زدن: دان لە ئاو› ۱۸. لێدان؛ وەنەدای؛ ئەنەدای؛ ژەندنی ساز ‹گیتار زدن: گیتار لێدان› ۱۹. *[مجازی، گفتاری]* دانان؛ دامەزراندن؛ ئەرەمەرزنەی؛ مەرزنایرە؛ خستنە ڕێ ‹فروشگاه زدن: فرۆشگە دانان› ۲۰. *[گفتاری]* وەشانن؛ وەشاندن؛ لێدان؛ شەی؛ شای؛ شانەی؛ وەنەدای؛ ئەنەدای ‹آمپول زدن: دەرزی وەشانن› ۲۱. *[گفتاری]* بەرهەم هێنان؛ سازین؛ چێ‌کرن؛ وەنەدای؛ ئەنەدای ‹روزی صد تا تلویزیون می‌زنند: ڕۆژی سەد دانە تەلەڤیزیون بەرهەم دەهێنن› ۲۲. *[گفتاری]* لێدان؛ لە چاپ دان؛ بڵاوکردنەوە ‹خبرش را زده بودند توی روزنامه: هەواڵەکەیان لە ڕۆژنامە دابوو› ۲۳. *[گفتاری]* پێوەدان؛ گەستن؛ پوەوەدەی؛ گەسەی ‹زنبور زدن: هەنگەژاڵە

پێوەدان› ◻*لازم.* ۲٤. *[گفتاری]* لێدان؛ پلدان ‹زدن نبض: لێدانی پتە› ۲۵. دەرهاتن؛ دەرکەوتن؛ دیارکەوتن؛ کەوتن؛ سەرهەڵدان؛ کەوتنە دیار؛ کەوتەی؛ زیای؛ زیەی ‹آفتاب زدن: هەتاو دەرهاتن› ۲٦. *[گفتاری]* دانان؛ گرتن ‹زدیم و کار تو گرفت: دامانا و کارەکەی تۆ گرتی› ۲۷. کوتان؛ هەوڵدان؛ تەقالاکردن؛ تێکۆشین ‹برای ریاست زدن: کوتان بۆ سەرۆکی› ۲۸. دان؛ نواندن؛ خۆ بە جۆرێ نیشاندان ‹خود را به مریضی زدن: خۆ لە نەخۆشی دان› ۲۹. نواندن؛ دانە چاوەوە ‹به سیاهی زدن: ڕەش نواندن› ۳۰. کردن؛ کەردەی؛ دەنگ دەرهێنان؛ بانگ کردن ‹فریاد زدن: هاوارکردن›. هەروەها: **زدنی**

■ **صفت فاعلی: زننده** (لێدەر)/ **صفت مفعولی: زده** (لێدراو)/ **مصدر منفی: نَزدن** (لێنەدان)

**زدوبند** / zad-o-band ، ـها/:*اسم. [مجازی]* کەینوبەین؛ سەر و ساخت؛ ساخت و پاخت؛ هاودەستی بۆ پیلانگێری ‹برای دزدیدن پولهای شرکت با حسابدار زد و بند کرده بود: بۆ قاپاندنی پارەی بەشدارگە لەگەڵ حسێبدارەکە کەینوبەینی کردبوو›. هەروەها: **زد و بند کردن**

**زدوخورد** / zad-o-xord ، ـها/:*اسم.* مشتومڕ؛ کوتەککاری؛ بەربەرەکانێ؛ شەقولەق؛ کار یان ڕەوتی لە یەکدان؛ پێکدادان؛ شەق شەی؛ چنگئاوش بوون؛ لە هەڤدوان؛ لە هەڤدان ‹در وسط عروسی کار به زد و خورد کشیده شد: لە ناو زەماوەنەکەدا کار گەیشتە مشتومڕ›. هەروەها: **زد و خورد کردن**

**زدودن** / zedûdan, zudûdan, zodûdan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**زدودی:** سڕیت؛ **می‌زدایی:** دەسڕی؛ **بِزدا:** بسڕە// ۱. سڕینەوە؛ ئەسترینەوە؛ سڕین؛ ڤەسڕین؛ سەڕتەی؛ لابردن؛ هەشفین؛ هەشفاندن؛ پاک کردنەوە؛ پاکەوکردن؛ خاوێن کردنەوە؛ پاکژ کردنەوە ‹چربی جامه را زدودن: چەوری سەر جلک سڕین› ۲. پرواندن؛ پروونەی ۳. کڕاندن؛ کڕنەی. هەروەها: **زدودنی**

■ **صفت فاعلی: زداینده** (سڕێنەرەوە)/ **صفت مفعولی: زدوده** (سڕێنراوە)/ **مصدر منفی: نَزدودن** (نەسڕاندنەوە)

**زده**[1] / zade ، ـها/:*اسم.* زەدە؛ کەلی؛ گۆسپە؛ ڕووشیاگی یان گەزن لە سەر شتێکەوە ‹سیبها زده داشتند: سێوەکان زەدەیان هەبوو›.

**زده**[2]: *صفت. [گفتاری]* وەڕەز؛ وەڕەس؛ وێڕس؛ کەیل؛ بێزار؛ ئالۆز؛ تووڕە؛ زویر؛ زیز ‹دیگر از درس و مدرسه زده شده: ئیتر لە وانە و قوتابخانە وەڕەز بووە›.

**ـ زده**[3]: *پیوازە.* ۱. ـ لێداو؛ ـ ئانگاز؛ ـ ئەنگاز؛ ـئەنگەز؛ ـ گەز؛ ـ ئاژۆ؛ ـ ئارۆ؛ ـ بردوو؛ ـ بردە؛ ـبردگ؛ ـ بەردە؛ ـگرتوو؛ ـ لێکەوتوو؛ ـ لێکەوتە؛ وەبەر گەزەن کەوتوو ‹آفتابزدە؛ گرمازدە؛ سرمازدە؛ سیلزدە: تاوانگاز؛ گەرمازۆ؛ سەرمابردوو؛ سێلاوگرتوو› ۲. وەڕەز؛ بێزار؛ زیز؛ ئالۆز.

**زده‌دار** / zadedār ، ـها/: *صفت.* زەدەدار؛ کەل؛ گۆسپە؛ سەقەت؛ عەیبدار؛ عەیبار؛ قەڵبە.

**زر** / zar/:*اسم. [ادبی]* زێڕ؛ زەڕ؛ ئالتوون؛ تەلا؛ تلا.

**زر** / zer/: *صوت.* زریکە؛ زیکە؛ زیقە؛ زیرە؛ زیق؛ زاک؛ زاق؛ زاکە؛ زاقە؛ قیژە؛ قیجە: ۱. دەنگی گریان ۲. دەنگی ناخۆش و دڵنەخواز (وەک دەنگی نک و نالە) ✻ **زر ـ زر**

▣ **زر زدن:** *[تعریض]* ۱. زریکاندن؛ زیقاندن؛ زیقانن؛ زیرەزیرکردن؛ زیق و هۆڕکردن؛ زریکنەی؛ باسنەی؛ گریان، بەتایبەت گریانی مندال ‹چرا بچه زر می‌زند؟: بۆ منداڵەکە دەزریکێنی؟› ۲. وڕ لێدان؛ ئەلف لەیلە خوێندن؛ بلوێر بەزاندن؛ سەلکە چۆلەکە قووت دان؛ ڕستن؛ قسەی بێکەلک کردن ‹چقدر زر می‌زنی!: چەند وڕ لێدەدەی!› ✻ **زر ـ زر کردن**

**زرادخانه** / zarrādxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کارگەی پێکهێنانی چەک و تەقەمەنی.

**زراعت** / zerā'at/: [عربی]/اسم. ۱. کشتوکاڵ؛ کەشتوکاڵ؛ کێشت؛ کەشتە؛ کەشاوەرزی ۲. ـها/ زار؛ جووت؛ هیتە؛ کێڵ؛ کار و ڕەوتی کێڵان.

**زراعتی** / zerā'atî/: [عربی] صفت. زاری؛ کێڵگەیی؛ چاندنی؛ کشتوکاڵی؛ کەشاوەرزی؛ فەلایەتی.

**زراعی** / zerā'î/: [عربی] صفت. کەشاوەرزی؛ زاری؛ کشتوکاڵی؛ پێوەندیدار بە کشتوکاڵەوە ‹زمین زراعی: زەوی کەشاوەرزی›.

**زرافه** / zarrāfe/: [عربی]/اسم. زەڕافە: ۱. ـها؛ ـگان/ گیانەوەرێکی گوانداری ملدرێژە کە بەرزیەکەی، لە سمیەوە هەتا نووکی شاخی شەش میتر دەبێ و گەڵای دار دەخوا ۲. [نجوم] شێوەیێکی ئاسمانی گەورە و کەمدرەوش لە ئاسمانی نیوەگۆی باکووریدا.

**زراندود** / zarandûd/: صفت. تەلاکفت؛ زێڕکفت؛ ئاوەزێڕ؛ ئالدوز؛ میتەلا؛ متەلا؛ بە ڕوویێکی داپۆشراو بە پەڕە یان ئاوی تەلا.

**زراندوز** / zarandûz، ـان/: صفت. پارەمۆڵ؛ زێڕباخن؛ ماڵدۆس؛ پارەدۆست؛ ماڵ و سامان خڕکەرەوە.

**زراندوزی** / zarandûzî، ـها/: اسم. ماڵدۆستی: ۱. کار یان ڕەوتی خڕکردنەوەی ماڵ و سامان ۲. ئۆگرەتی یان گزەگزی سەر ماڵدۆستی ‹زراندوزی با پارسایی سازگار نیست: ماڵدوستی لەگەڵ پارێزگاریدا یەک ناگرنەوە›.

**زراوند** / zarāvand/: اسم. کالیارەتاڵە؛ کالەگەمارانە؛ کارەکەمارانە؛ کالەکەماران.

**زربافت** / zarbāft/: صفت. زێڕبافت؛ زێڕباف؛ زێڕچن؛ چنراوەیەک کە تاڵی زێڕینی تێدا دەکار کرابێ.

**زربفت** / zarbaft/: صفت. [ادبی] زێڕبافت؛ زێڕباف؛ زەری؛ زێڕتاڵ؛ قوماشی ڕایەڵزێڕ.

**زربین** / zarbîn، ـها/: اسم. درەختێک لە تیرەی سەروەوان، بە کۆتەرەی ڕاستی ڕێ ڕێ و گازدار، کاژی ناسک و ڕەنگی قاوەیی ڕۆشن، پەلوپۆی ئاسۆیی، گەڵای وەک دڵ، چێوی گەزۆداری بۆنخۆش و هەڵکەر لە شۆی زۆردا کە لە پیشەسازیدا بە کاری دێنن.

**زرت** / zert/: صوت. [گفتاری، مستهجن] تڕ؛ شیڕ؛ جڕ؛ دەنگی بەر بوونەوەی بای سک.

▣ **زرت چیزی/ کسی در رفتن**: [کنایی] تەکەی گوێ/ مل کەسێ هاتن؛ تڕی شتێ/ کەسێ بڕیان؛ پوان؛ لە کارکەوتن: **زرت چیزی/ کسی قمصور شدن**

زرت چیزی/ کسی قمصور شدن ☜ **زرت چیزی/ کسی در رفتن**

**زرت** / zorrat/: [از عربی] ☜ **ذُرَّت**

**زرتار** / zartār/: صفت. زێڕتاڵ؛ زێڕتان؛ زێڕتار؛ پارچەی ڕایەڵ زێڕین.

**زرتشتی** / zartoštî/: اسم. ۱. زەڕدەشتی؛ زەڕتوشتی: ۱. دینێ کە زەڕدەشتی پێغەمبەر (ڕەنگە لە سەردەشتەوە لە سەدەی شەشی پێش لە زایین) دایهێنا ۲. ـها؛ ـان/ گاور؛ گەور؛ هەر یەکە لە پیڕەوانی ئەم دینە ✱ **زردشتی**

**زرتی** / zertî/: قید. [گفتاری، مستهجن] فرت؛ ناکاو؛ لەپڕا؛ زڕت؛ یەکهەو؛ ژنشکاڤ؛ نشکاڤ؛ نشکا ‹تا کشیدم، زرتی پاره شد: هەر کێشام، فرت قرتا›.

**زرخرید** / zarxarîd/: صفت. زەرخڕی؛ زەرخڕید؛ زێڕکراو؛ زێڕسەنراو؛ زێڕکڕ؛ زێرخڕی؛ سەندراو بە پارە (زێڕ) ‹بندەی زرخرید: کۆیلەی زەرخڕی›.

**زرخیز** / zarxîz/: صفت. نەخت؛ بە وەچ؛ ماک؛ ماکە؛ زۆر بەرهەمدار و بایەخدار لە بواری سامانی سروشتی و کانگای پربایەخەوە ‹خاک زرخیز: خاکی نەخت›.

**زرد**[1] / zard/: اسم. زەرد؛ زەر؛ یەکێ لە ڕەنگە سەرەکیەکان لە شێوەی ڕەنگی لیمۆی گەییو،

گوڵی ڕۆجیارپەرشت یان زەردەچێوە: *الف)* ڕەنگێ کە لە شەبەنگدا دەکەوێتە نێوان ڕەنگی کەسک و نارنجیەوە *ب)* پرشنگێ بە درێژی شەپۆلی نێوان ٥٧٥ تا ٥٩٥ نانۆمیترەوە.
هەروەها: **زردرنگ**؛ **زردفام**

▣ **زرد طلایی**: زەردی زێڕی؛ زەردی ورشەدار بە ڕەنگی زێڕ.
**زرد قناری**: زەردی قەناری؛ زەردی زەرد؛ زەردی تۆخ.
**زرد کادمیم**: زەردی کادومیوم؛ زەردی ئاماڵ نارنجی.
**زرد کاهی**: کاڕەنگ؛ زەردی ڕۆشن.
**زرد ناپل**: زەردی ناپل؛ زەردی تەلایی خەست.
**زرد هانزا**: زەردی مات.

**زرد**[2]: *صفت*. زەرد: ١. بە ڕەنگی زەرد ٢. *[مجازی]* ژاکاو؛ کز؛ پەژمەراو؛ بێ‌تین؛ نەخۆش؛ نەوەش.

▣ **زرد شدن**: زەرد بوون: ١. سیسیان؛ ژاکان؛ پەژمران؛ چەرمسین؛ گەچلان؛ ژاکیای؛ سیس بوون؛ دامرانی گوڵ و گیا بە هۆی گۆڕانی وەرز یان نەخۆشییەوە ٢. زەرد هەڵگەڕان؛ بوونە زەرد؛ ڕەنگی زەرد پەیدا کردن.
**زرد کردن**: *[تعریض]* خۆ چەپەڵ کردن؛ زەردکردن؛ خۆ تەڕکردن؛ وێ پیس کەردەی؛ گووکردنە خوێدا؛ زۆر ترسان ‹آرام حسابی زرد کرده بود: ئارام تەواو خوی چەپەل کردبوو›.

**زرداب** / zardāb/: *اسم*. *[گفتاری]* زراو؛ زەرتاڵ؛ زاڵی؛ سەفرا؛ زەرداو؛ تراوێکی زەردی ئاماڵ‌سەوزی تاڵە لە جەرگەوە دەدەڵێ و چەوری پێ‌دەتوێتەوە.

**زردآلو** / zardālû، ـها/: *اسم*. قەیسی؛ شێلانە؛ شەلانی؛ شەلانە؛ شێلانی؛ شێلانێ؛ شلانی؛ شلانە؛ زەردلی؛ زەردەلی؛ زەردالی؛ زەردالۆ؛ زەردەلوو؛ مژمژ؛ مژمژە؛ هیرۆگ؛ مشمش: ١. درەختێ بە گۆنە و جۆرگەلی زۆرەوە، گەڵای بێ‌تووک و هێلکەیی و ددانەدار و گوڵ سپیکەڵەوە کە بەرەکەی خۆراکیە ٢. میوەی ئەو دارە کە گۆشتن و ئاودارە و درزێکی پێوەیە و ناوکەکەی سفت و سافە.

**زردبید** / zardbîd/ ☜ بید زرد، **بید**

**زردپوست** / zardpûst، ـها؛ ـان/: *صفت*. زەردپێست؛ زەردپۆس؛ پێوەندیدار یان سەر بە یەکێ لە چوار گرۆی گەورەی ڕەگەزی مرۆ، خەڵکی ڕۆژهەڵاتی دوور، بە پێستی زەرد، چاوی کێشراو و قژی ڕەش و سافەوە.

**زردپی** / zardpey/: *اسم*. بەندۆک؛ وردەمار؛ وردەڕەگ؛ نەوارێکی سفت و پتەو لە شانەی لفکەیی کە سەری جمگەی ئێسکەکان پێکەوە دەلکێنێ، یا ئەندامان لە سەر جێی خۆیان ڕادەگرێ.

**زردچوبه** / zardčube/: *اسم*. زەردەچێوە؛ زەردەچۆ؛ زەرچەوە؛ زەردەجوە؛ زەردەچەوە؛ ژەرژووە؛ کرکم؛ ڕەهازەر: ١. *[ها]* گیایێ ئاڵفی لە دەستەی زەنجەفیلان ٢. وشکەوەکراوی گیای ڕەهازەر کە بۆ ڕەنگ‌جوانی و بۆنخۆشی دەیکەنە نێو چێشتەوە.

**زردخار** / zardxār/: *اسم*. دروەزەردە؛ زەردەسیری؛ گیاییکی درکاوی ڕەنگ زەردە، زۆرتر لە نێو جاڕ و دەیم و کێڵگەدا دەڕوێ.

**زردرو** / zardrû/: *صفت*. ڕەنگ‌زەرد؛ ڕووزەرد؛ زەرد داگەڕاو: ١. زەردۆلە؛ زەردوولە؛ زەردەلە؛ زەرزەپالی؛ خاوەن ڕوخساری زەرد بە هۆی نەخۆشی، برسیەتی یان شەکەتیەوە ٢. *[گفتاری]* ترساو یان شەرمەزار.

**زردرویی** / zardrûyî/: *اسم*. ڕووزەردی؛ ڕەنگ‌زەردی؛ دۆخ و چۆنیەتی زەرد و کز بوونی ڕوخسار.

**زردزخم** / zardzaxm/: *اسم.* زەرپیز؛ نەخۆشینێکی پێستی چەتوون و میکرۆبی کە ئەگەر پەرەی ساند، بە شێوەی بلۆقگەلێکی چلکی و زۆر گیرۆ دەردەکەوێ.

**زردشتی** / zardoštî/ ☜ **زَرتُشتی**

**زردک** / zardak ، ـها/: *اسم.* گێزەر؛ گەزەر؛ گزەر؛ گەزەرکی؛ هەویج.

**زردماهی** / zardmāhî ، ـها/: *اسم.* زنێر؛ سمبێلەک؛ ماسیەزەردە؛ زەردەماسی؛ جۆرێک ماسی زەردکارە لە ئاوی شیرینی چۆم و رووباران دەژی.

**زردنبو** / zardambû, zardanbû ، ـها/: *اسم.* *[مجازی، گفتاری]* ١. زەرد داگەڕاو؛ بێ ڕەنگ؛ ڕەنگ‌پەڕیو؛ ماخەزەرد؛ مەڕەمووکە؛ خاوەن ڕوخسارێ کە لە بەر نەخۆشی یان کزی زەرد بووە ٢. زەردهەڵگەڕاو؛ زەردەوبووگ؛ بە ڕەنگی زەرد کە نیشانەی ژاکاوی و سیسیە ‹خیار زردنبو: خەیاری زەردهەڵگەڕاو›.

**زردوزی** / zardûzî ، ـها/: *اسم.* زێڕبافی: ١. هونەر یان لێزانی دروومانی نەخش و نیگار لە سەر جل‌وبەرگەوە بە بەنی زەردی زێڕین ٢. جل‌وبەرگێ کە زێڕدووری لە سەر کراوە ٣. کارگەیێ کە ئەو کارەی تێدا دەکرێ. هەروەها: **زردوز**

**زرده** / zarde ، ـها/: *اسم.* زەردێنە؛ زەردێنک: ١. زەردینە؛ زەرک؛ زەرتک؛ زەردکی؛ ماکی ڕەنگ زەردی ناو هێلکەی پەلەوەران ٢. *[زیست‌شناسی]* ماکی پاشەکەوتی هێلکۆکە لە زۆربەی گیانەوەراندا کە تەژی لە پرۆتئین و چەوریە.

**زردی** / zardî/: *اسم.* زەردی: ١. زەراهی؛ زەردایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی زەرد بوون ٢. *[گفتاری]* زەردوویی؛ یەرەقان؛ بەزەک؛ زەردەیی؛ زەرکی؛ زەرۆکی؛ زەرەک.

**زردینه** / zardîne/: *اسم.* *[گیاه‌شناسی]* زەردێن؛ ڕەنگدێنێ کە لە ئەندامانی بێ‌سەوزێنی گیادا بەدی‌دێ و دەبێتە هۆی بەدیهاتنی ڕەنگی زەرد.

**زر ـ زر** / zerzer/ ☜ **زر**

▣ **زر ـ زر کردن** ☜ زر زدن، زر

**زر ـ زرو** / zerzerû/: *صفت.* *[گفتاری]* زیقن؛ زیقاوڵ؛ زیقاوڵە؛ میزن؛ گرینۆک؛ جیقن؛ خاوەن خوو یان خدەی زار و زیقەکردن ‹بچەی زر ـ زرو: منداڵی زیقن›.

**زرزوره** / zorzûre ، ـها/: *اسم.* پەسپەسکەرە؛ پەسپەسەکۆڵە؛ پەسپەسەکەرە؛ تەڤنپیرک؛ کاکڵەمووشان؛ داپیرۆشک؛ جیلاباف؛ جۆڵاتەنە؛ جاڵ‌جاڵۆکە؛ داوتەنە؛ تارتنۆک؛ جاتەنە.

**زرشک** / zerešk,zerešg ، ـها/: *اسم.* زریشک؛ زریسک؛ دڕکەزی؛ زێ؛ دەوەنێکی دڕکاویە بە گوڵی زەردی هێشوویی و بەری خڕی سوورەوە ٢. بەری ئەو دەوەنە کە ترشە و هەم بۆ نێو چێشت (پلاوزریشک) و هەم وەک خواردنەوە (ئاوزریشک) دەخورێ * **زرشگ**

**زرشک‌پلو** / zereškpolow, zerešgpolo:/: *اسم.* زریشک‌پلاو؛ جۆرێ پلاوە، کە گۆشت (زۆرتر گۆشتی مریشک)، زریشک و زافەرانی تێکەڵە.

**زرشکی**[1] / zereškî, zerešgî/: *اسم.* زریشکی؛ ڕەنگی سووری ئاماڵ کەوە: **زرشگی**. هەروەها: **زرشکی‌رنگ**

**زرشکی**[2]: *صفت.* زریشکی؛ بە ڕەنگی زریشکیەوە: **زرشگی**

**زرشگ** / zerešg/ ☜ **زرشک**

**زرشگی** / zerešgî/ ☜ **زرشکی**

**زرفین** / zorfîn/ ☜ **زُلفین**

**زرفینک** / zorfînak/: [؟] *اسم.* *[گیاه‌شناسی]* ئەندامی زاوزێی مێینە لە قەوزەگەڵدا.

**زرق‌وبرق** / zarq-o-barq/: [عربی] *اسم.* زریقە و بریقە؛ بریچە؛ زریق و بریق؛ زەرق و بەرق؛ خشڵی بەرچاوگر، دیار و بێ‌بایەخ ‹گول زرق و

برق دخترک را خورد: فریوی زەرق و بەرقی کچەتیوی خوارد›.

**زرک** / zarak/:اسم. ۱. پەڕەی زۆر ناسکی زێڕ کە لە بەر تیشکدا سەوز دەنوێنێ و لە زێڕین‌کردنی شیشەدا بە کار دێ ۲. [قدیمی] گەردەیەکی ڕەنگ زێڕین کە ژنان دەیانپژاندە سەر قژیاندا.

**زرکش** / zarkeš/:اسم. زێڕباف: ۱. زێڕدوور ۲. زێڕکار؛ زێڕچن؛ بە زێڕچنراو.

**زرکوب** / zarkûb/: صفت. زێڕکوت: ۱. زێڕکفت؛ بە ڕووپەری زێڕکاری کراوەوە ۲. زێڕنووس؛ زێڕنەخش؛ بە بەرگی نەخشاو یا نووسراو بە ڕەنگی کانزایی بریقەدارەوە.

**زرکوبی** / zarkûbî/:اسم. زێڕکوتی؛ کاری کوتانی نەخش و نیگار بە کانزا بەتایبەت زێڕ بە سەر ڕووپەڕێکەوە.

**زرگر** / zargar ، ـها؛ ـان/:اسم. ۱. زێڕکار؛ زێڕینگەر؛ زەڕنگەر؛ زێڕگەر؛ زەرگەڕ؛ ئاڵتوونچی؛ پیشەسازێ کە بە زێڕ و بەردی بە نرخی‌تر خشڵ و کەرەسەی جوان و ڕازێنەر دروست دەکا ۲. تەلافرۆش؛ زێڕفرۆش؛ کەسێ کە ئەو خشڵ و زەمبەرانە دەسێنێ و دەفرۆشێتەوە ✽ **طلاکار؛ طلاگر**

**زرگری** / zargarî/:اسم. زێڕینگەری: ۱. کار و ڕەوتی دروست‌کردنی کەرەسەی جوانی لە زێڕ و بەردی بە نرخی‌تر ۲. [ـها] کارگای زێڕینگەر ۳. [ـها] تەلافرۆشی؛ گەوهەرفروشی؛ فرۆشگای زێڕ و بەردی بە نرخ.

**زرگون**[1] / zargûn/: [فرانسوی از آلمانی از سریانی از طریق عربی]اسم. ☜ **زیرکون**

**زرگون**[2]: صفت. زەڕاسا؛ زێڕین؛ تەلایی؛ زێڕواشە؛ زەربەش؛ زەردیلە؛ زەردواش؛ زەردباف؛ وەکوو زێڕ.

**زرنا** / zornā/ ☜ **سُرنا**

**زرنب** / zarnab/ ☜ **سُرخدار**

**زرنگ** / zerang ، ـها/: صفت. [گفتاری] زرنگ؛ زرینگ؛ زیت؛ زیتەڵ؛ زبت؛ زرک؛ زیکل: ۱. وریا؛ وشیار؛ شووت؛ هلدایی؛ هەوار؛ کۆنا؛ زیرەک؛ وتە؛ قوتە؛ بە هۆش؛ هایا؛ لوکوش؛ ئیار؛ یەمان ۲. مەزبووت؛ بەچنگ؛ گرژ؛ کرژ؛ تروسک؛ لۆبت؛ لۆتەر؛ گورد؛ بەکار؛ خەیرا؛ چابک؛ چالاک؛ چەنگ‌چیل؛ بزۆز؛ ئازا؛ قۆچاخ ۳. سەهەندە؛ سەهەنە؛ سەهندە؛ گورد؛ گورج؛ گوربز؛ چەلەنگ.

**زرنگار**[1] / zarnegār/:اسم. زەڕنیگار؛ بەرنامەیێکی کەمپیوتەری بۆ نووسین.

**زرنگار**[2]: صفت. [ادبی] زێڕنەخش؛ زێڕکێش؛ نەخش‌تەلایی.

**زرنگی** / zerangî/:اسم. زرنگی؛ زرینگی؛ وریایی؛ کەلپەی؛ دۆخ یان چۆنیەتی زرنگ بوون.

**زرنیخ** / zarnîx/:اسم. [شیمی] زەرنەق؛ زەڕنیق؛ زەڕنیخ؛ کانزایەکی زەردە بە ناوی سولفیدی ئارسنیک.

**زرورق** / zarvaraq ، ـها/: [فارسی/ عربی]اسم. زەڕوەرەق: ۱. پەڕەیەکی ناسک، پتەو و هێندێک ڕوون، بە ڕەنگی جۆراوجۆرەوە کە لە هەویری مەژگی چێو دروست دەبێ ۲. پەڕەیێ کە یەک لا یان هەر دوو لای بە تێکەلاو لە ڕەنگدانە (سپی یان ڕەنگی‌تر) و ماکێکی چەسپناک داپۆشراوە و بریقەی لێ‌خراوە و بۆ بەستەبەندی و زێڕکوتی بەرگ، کەلکی لێ دەگرن.

**زروزیور** / zar-o-zîvar/: [فارسی/ سغدی]اسم. خشڵ و زەمبەر؛ زێڕ و زەمبەر؛ زێڕ و زیو؛ زەڕ و زێوی بایەخدار.

**زره** / zereh ، ـها/:اسم. زری؛ زرخ؛ زرە: ۱. [قدیمی] بەرگی شەڕ؛ بەرگێ لە ئاڵقەگەلی پۆلایی ناسک و باریک کە بۆ بەرگری لە گەزنی تیر و شیر لە شەڕدا دەبەر دەکرا ۲. پەڕەی پۆلا

یا ئالیاژگەلی قایم کە ماشین و کەشتی شەڕی پێدادەپۆشن.

**زرهپوش** / zerehpûş ، ـها/:اسم. زریٚ پۆش؛ دەبابە؛ جۆریٚ ماشینی چەکداری یا ناوی جەنگی کە تەنەکەی بە کانزایەکی قایم داپۆشراوە تا گوللە نەیسمیٚ.

**زرهدار** / zerehdār ، ـها؛ ـان/:اسم. زرێدار؛ خاوەن زریٚ؛ بە زریٚ.

**زرهی** / zerehî/: صفت. ١. [نامتداول] زرێدار ٢. زرەیی؛ زرێهی؛ سەر بە یەکەی چەکداری کە بە ئامرازی زرێدارەوە شەڕ دەکا.

**زری** / zarî/:اسم. زێڕی؛ زەڕی: ١. پارچەی هەورێشمی کە بە گولابەتوون نەخشی زەقیان لە سەری چنیوە ٢. قوماشیٚ کە تالی زێڕی یا زیوینی تێدا بە کار چووە.

**زرین** / zarrîn/: صفت. [ادبی] زێڕن؛ زێڕین؛ تەلایی.

**زرین‌ماهی** / zarrînmāhî/:اسم. ١. /ـها؛ ـان/ جۆریٚ ماسی چکۆلە کە زۆرتر بە ڕەنگی زەردی تەلاییە و لە ناو حەوز یان ئاکواریومدا ڕایدەگرن ٢. [نجوم] وێنەیەکی گچکەی ئاسمانی لە خولگەی جەمسەری باشووریدا: **شمشیرماهی**

**زشت** / zešt/: صفت. کەسن؛ ناشیرین؛ دشت؛ دشتە؛ زشت؛ نەچیٚ؛ کرێت: ١. بە چۆناوچۆنی خراپ و نالەبارەوە ‹حرف زشت: قسەی ناشیرین› ٢. قێزە؛ گەست؛ ناحەز؛ دزێو؛ دەعەجانی ‹چهرەی زشت: تەشکی ناشیرن›. هەروەها: **زشت بودن؛ زشت شدن؛ زشت کردن**

**زشتخو** / zeštxû ، ـها؛ ـان/: صفت. کرێت؛ بەخۆ؛ ڕەزاتاڵ؛ ڕەزاگران؛ ڕەزاقورس؛ ئێسک‌قورس؛ خوێنتاڵ؛ بەدخوو؛ ناخار. هەروەها: **زشتخویی**

**زشترو** / zeštrû ، ـها؛ ـیان/: صفت. بەدتەشک؛ ناشیرین؛ ناحەز؛ گەمر؛ کرێت؛ بە دیمەنی ناحەزەوە. هەروەها: **زشترویی**

**زشتی** / zeštî ، ـها/:اسم. زشتی؛ کرێتی؛ کەسنی؛ گەمری؛ دشتی؛ ناحەزی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ناشیرین و ناحەز بوون.

**زعامت** / za'āmat/: [عربی] اسم. [ادبی] ڕێبەری؛ ڕێبەرایەتی؛ سەرکردایەتی.

**زعفران** / za'farān, za'ferān/: [عربی] اسم. زەعفەران؛ زافەران؛ زافران؛ زەحفەران؛ زەفیروو؛ زەردیباخ: ١. /ـها/ گیایەکی ئالفی لە تیرەی زەمەقان بە شێوەی جۆراوجۆر، گۆشتن، بە گوڵی بنەوشی ئاڵ یان ئەرخەوانییەوە ٢. گەردەی ئەو گیایە، بە بۆنی تیژ و تامی توندەوە کە بۆ جوان و بۆنخۆش‌کردنی خۆراک بە کار دیٚ.

**زعفرانی** [1] / za'farānî, za'ferānî/: [عربی] اسم. [ادبی] زەعفەرانی؛ زافرانی؛ زافەرانی؛ زەحفەرانی؛ ڕەنگی زەردی ئامال نارنجی. هەروەها: **زعفرانی‌رنگ**

**زعفرانی** [2]: صفت. زەعفەرانی؛ زافەرانی؛ زافرانی: ١. بە ڕەنگی زافەران ٢. زافەران دار؛ زافەران تێکراو.

**زعم** / za'm/: [عربی] اسم. [ادبی] گومان: ١. دوودڵی؛ دلاودلی؛ سۆ ٢. خەیاڵ؛ ئەندێشە؛ ڕەت؛ گزەگز؛ بیر؛ هزر؛ ویر.

▣ **به زعم کسی**: بە گومانی کەسێک.

**زعما** / zo'amā/: [عربی] جمعِ ☜ **زَعیم**

**زعیم** / za'îm ، ـان؛ زُعَما/: [عربی] اسم. [ادبی] پێشەوا؛ ڕێبەر؛ سەرکردە؛ سەرۆک؛ یەمان؛ گەورەی خێڵ.

**زغال** / zoqāl ، ـها/:اسم. سوخاڵ؛ زوخاڵ؛ زغاڵ؛ زخاڵ؛ زووخاڵ؛ زۆخاڵ: ١. خەڵووز؛ خڵووز؛ خلۆز؛ ڕەژی؛ ڕەژوو؛ ڕێژی؛ ڕێژوو؛ کۆمر؛ ماکێکی سووتەمەنی ڕەش کە لە ناتەواو سووتانی چێو لە شوێنێکی سەر بەستراودا بەرهەم دیٚ ٢. ماکیٚ کە زۆربەی پێکهاتەکەی کەربونی پەتیە و لە تنۆکاندنی چێو، پێشە یان شەکر پەیدا دەبیٚ و لە کاتی سووتاندا دووکەڵی

نیە و گەرمای زۆر بەدی دێنێ ٣. میلەی لە جنسی فریت کە لە ڕادیۆدا بە کار دێ ٤. میلەیێ لە جنسی سوخاڵ کە بەرق دەگەیێنێتە موتور * ذغال

▣ **زغال حیوانی**: خەڵووزی گیانەوەری؛ سوخاڵێ کە لە سووتاندنی ماکی گیانەوەر دروست دەبێ، فوسفاتی زۆر و کەربونی کەمی تێدایە و لە ڕەنگ سڕیدا بە کار دێ.

**زغال زنده**: خەڵووزی زیندوو؛ سوخاڵێ کە هیدرۆکەربونی لێگیراوە و هێزی ڕاکێشانی زۆرتر کراوەتەوە: **زغال فعال**

**زغال سنگ** ☜ **زغالسنگ**

**زغال فعّال** ☜ **زغال زنده**

**زغال قرع**: سوخاڵێ بێخەوش کە دەنیشێتە سەر دیوارەی کوورەی پاکژ کردنی سوخاڵەوە و بۆ دروستکردنی جەمسەری سوخاڵی بە کەڵک دێ.

**زغال قهوەای**: جۆرێ بەردە خەڵووزی قاوەیی، پێکهاتەکەی وەکوو چێوە و دووکەڵی شۆڵەکەی زۆرە.

**زغالاختە** / zoqālaxte ، ـها/: [فارسی/ ترکی]/اسم. کفری؛ کیفری؛ کوفێری؛ مڕ: ١. دارچکێکی لێڕەواری، شەتڵی و هەمیشە سەوزە ٢. بەری ئەو دارچکە کە خڕێکی سوورتۆخە، ناوکەکەی درێژ و تامی ترش و شیرینە و بە کەڵکی خواردن و دەرمانیش دێ.

**زغالدانی** / zoqāldānî ، ـها/: اسم. ڕەژیدان؛ سوخاڵدان؛ زوخاڵدان؛ زغاڵدان؛ خەڵووزان؛ خەڵووزدان: ١. هەماری خەڵووز تێدا هەڵگرتن ٢. جێزوغاڵ؛ مەنقەڵ؛ دەفری هەڵگرتنی خەڵووز ٣. *[کنایی]* کوناگورگ؛ جێگەی تەنگ و تاریک و پیس.

**زغالسنگ** / zoqālsang/: اسم. بەرکەمرە؛ کەمر؛ کۆمڕ؛ خەڵووزەبەردینە؛ هەر کام لە بەردگەلی سووتمانی کە لە گۆڕانی سروشتی گیاگەلی کۆنە مردووی ژێر زەویدا پێکدێ و بە پێی ڕێژەی کەربون و شۆ، چەند جۆری لێدەبێتەوە.

▣ **زغالسنگ خشک**: کۆمڕی وشک؛ کەمرە وشکە؛ بەرکەمرەی وشک؛ خەڵووزەبەردینەی وشک؛ جۆرێ بەردە خەڵووزی ڕەشی بریقەدار، داگری ٩٠٪ کەربون کە بە ئاستەم و بە گڕێکی بێهێز و بێبۆن و دووکەڵەوە دەسووتێ.

**زغالسنگ قیری**: بەردە خەڵووزی ڕەشی ئاسایی بە کەربونی زۆر و ئاوی کەمەوە، بێدووکەڵ و بە گەرمای زۆرەوە دەسووتێ.

**زغالسنگ نارَس**: بەردە خەڵووزی پێنەگەییو و سۆک بە ڕەنگی قاوەیی یا ڕەشەوە کە بە ئاستەم دەسووتێ و بۆنێکی ناخۆشی لێ هەڵدەستێ.

**زغالی**[1] / zoqālî ، ـها/: اسم. خەڵووزفرۆش؛ سوخاڵفروش؛ فرۆشەری خەڵووز.

**زغالی**[2]: *صفت.* خەڵووزی؛ سوخاڵی؛ زوخاڵی: ١. شیاو بۆ دروستکردنی زوخاڵ ‹چوب زغالی: چێوی خەڵووزی› ٢. خەڵووزاوی؛ خەڵووزین؛ بە سوخاڵەوە تلاو ‹با دست و صورت زغالی بیرون آمد: بە دەست و دەم و چاوی خەڵووزییەوە هاتە دەرێ›.

**زغره** / zaqre ، ـها/: اسم. پەراوێز؛ نەوارێ کەم تا کورت پان لە لێواری ئاسەڕی کڵاوەوە بۆ بەرگری لە دەردانی ئارەق یان چەوری.

**زغن** / zaqan ، ـها/: اسم. قیژ؛ قاژوو؛ قژاک؛ قەلەبازەلە؛ کۆرکۆرە؛ کۆڕکۆڕ؛ کۆلارە؛ قشقەڕە؛ مشکخۆر؛ مشکگیر؛ پەلەوەرێکی لەش ناوەندی کە لە گوانداراني چکۆلە و خزۆکان یان لاشەی گیانەوەرانیتر بژیوی خۆی دابین دەکا: **غَلیواج؛ غَلیواژ؛ موشگیر**

**زغنبود** / zaqnabûd/: اسم. ژەقنەمووت؛ زەقنەپووت؛ زەقنەبووت؛ ژەقنە؛ زەقنە؛

هەلایهەل؛ گەرانی؛ زەبرەبەند؛ زلفنج؛ کندرووس؛ قوزەلقورت؛ دەرد؛ وشەی جنێو، هاوواتای زەهری مار.

**زفاف** / zafāf/: [عربی]/اسم. زافانی؛ بووکێنی؛ چوونە پەردە؛ هاوخەوی بووک و زاوا.

**زفت** / zaft/: *صفت. [ادبی]* ئەستوور؛ قەلەو؛ کلفت؛ کلۆفت؛ کولفت؛ چاخ؛ زنتۆل؛ زەبلاح.

**زفت** / zeft/: /اسم. زەفتە؛ زفت؛ زەفت؛ قیری سروشتی؛ هیدروکەربونی نەگۆڕ یان هەویری کە لە کۆندا لە قەلشتی برێ بەردەوە دەیانگرت و بۆ دەرمان بە کار دەهات.

▣ **زفت انداختن:** زەفتە لێدان؛ قیرتاو لێدان؛ ساوینی زفت بە سەر قوماش و لکاندنی بە سەر شوێنێک لە لەشدا.

**زفت** / zoft/: *صفت. [ادبی]* ١. ڕژد؛ دەس‌وشک؛ بەرچاوتەنگ؛ چرووک؛ چکوود؛ چکووس؛ پیسکە؛ قرچۆک ٢. بەوتاو؛ تفت و توون؛ بە چێژەی ناخۆشەوە.

**زق** / zoq/ ☜ **زُق ـ زُق: ذق**

**زق ـ زق** / zoqzoq/: /اسم. *[گفتاری]* ژانی تاو ـ تاو؛ ئێشێ کە لە مەوداگەلی کورت و پەیتا ـ پەیتادا سەر هەلدەدا: **زق**

▣ **زق ـ زق کردن:** چلدان؛ چل کێشان/ شانەی؛ برووسکە وەشاندن؛ ئێش کردنی پەیتا ـ پەیتا ‹وقتی آب سرد می‌خورم دندانم زق ـ زق می‌کند: کە ئاوی سارد دەخۆمەوە ددانم چل ندەدا›.

**زقوم** / zaqqûm, zaqqom/: [عربی]/اسم. ١. ژاری‌مار؛ زەهرەمار؛ زەهری هەلایل؛ ژاعربیایش؛ هەر شتێکی زۆر تال کە ڕەنگە ژاراویش بێت ٢. *[اسلام]* دارێکە لە جەحانمدا کە بەرەکەی یەکجار تالە.

**زکاب** / zakāb/: /اسم. زاخاو؛ زاخی تاوێندراوە کە بۆ قایم‌کردنەوەی شتی لەق بە کار دێ.

**زکات** / zakāt/: [عربی]/اسم. *[اسلام]* زەکات؛ هەندی دیاریکراو لە مالی موسلمان کە دەبێ دەریکا و بیداتە ئەوانەی پێیان دەگا: **زکوه**

▣ **زکات فطر:** سەرفترە؛ سەرفیترە؛ سەروترە؛ دراو یان مالێ کە دوای ڕۆژووی ڕەمەزان بە هەژار و نەدار دەدرێ.

**زکات مال:** زەکاتی مالیات؛ موسلمان ئەگەر مالی (واتە مانگا، پەز، وشتر، زێڕ یان زێو، گەنم، جۆ، خورما و مێوژی) بگاتە ڕادەیەکی دیاریکراو، دەبێ بەشێکی بدا بە ئەوانەی پێیان دەگا.

**زکام** / zokām/: [عربی]/اسم. هەلامەت؛ ئەلامەت؛ ئالامەت؛ حەلامەت؛ هالمەوت؛ هەلا؛ پەتا؛ ساڤ؛ پەسیوو؛ پەسیو؛ پەسیڤ؛ پەرسیڤ؛ پەرسیڤ؛ پەرسیو؛ بابینی؛ ئاسرم؛ ئارسم؛ دەمەنی؛ پەژیک؛ مرک؛ تماو؛ فرڤینک؛ دیاردەی ئاییسان و ئاو پێداهاتنی چاو و لووت، هاوڕێ لەگەل پژم و هۆڕدا.

**زکوه** / zakāt/: [عربی] ☜ **زکات**

**زکی** / zakî ، ازکیا/: [عربی] *صفت. [ادبی]* پاک: ١. خاوێن؛ تەمیس ٢. پارسا؛ پارێزگار؛ چاکەکەر؛ خۆپارێز.

**زکی** / zekî/: *صوت. [گفتاری، مستهجن]* ترحێو؛ ترحەو؛ شیڕ؛ پیتی تیتالی و ڕشخەن ‹زکی! ساعت دوازده است و آقا می‌گوید: صبح به خیر: ترحیو! سەعات دوازدەیە و ئابرام ئێژێ: بەیانی باش›.

**زگیل** / zigîl, zegîl/: /اسم. بالووکە؛ بالووک؛ بالۆکە؛ بالوویک؛ بالۆک؛ بایلە؛ ئازەخ؛ گەندمە؛ گەنمە؛ سگل؛ پالوو؛ کار: ١. دیاردەی ویرووسی، بە شێوەی هەلتۆقاویەکی نەپۆڕ بە سەر پێستەوە ٢. هەر جۆرە هەلتۆقاوەیەکی وەک بالووک.

**زل** / zol/: /اسم. ماق؛ واق؛ زەق؛ دۆخی چاو برینە شتێ بۆ ماوەیەک.

▣ **زل زدن:** ماق بوون؛ زەق بوونەوە؛ ماق

بوونەوە؛ چاو برینە شوێنێ یا شتێ.

**زل- زل نگاه کردن**: زاق- زاق ڕوانین؛ زل-زل ڕوانین؛ چاو تێبڕین؛ ماقەوە بوون؛ بە پێداگری و سەرنجەوە ڕوانین.

**زلال** / zolāl/: [عربی] صفت. زەلاڵ؛ زولاڵ؛ چاوقرژانگ؛ زۆر ڕوون و بێخەوش (بەتایبەت بۆ تراوان).

**زلالیه** / zolālîyye/: [عربی]/اسم. تراوێکی ڕوون و لینج کە لە چاوی مۆرەدارانـدا، مـەودای نێوان گلێنە و زوجاجیە پڕ دەکاتەوە.

**زلزله** / zelzele، ـها/: [عربی]/اسم. بوومەلـەرزە؛ بۆمەلـەرزە؛ بوولـەرزە؛ بووەلـەرزە؛ بێمەلـەرزە؛ بیڤەلەرز؛ زەویلـەرزە؛ زەمـینلـەرزە؛ زەلزەلـە؛ ژێلی عەرد؛ لەرزان؛ لەرزەک؛ هەژانی زەوین.

**زلزله‌سنج** / zelzelesanc، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. لـەرزەپێو؛ ئـامرازی ئەنـدازەگرتنی لـەرەی زەوی بەتایبەت لە کاتی بوومەلەرزەدا.

**زلزله‌نگار** / zelzelenegār/: [عربی/ فارسی]/اسم. لەرزەنووس؛ کەرستەیێ بـۆ ناسـین و نووسـینی شەپۆلی لەرە، بەتایبەت بۆمەلەرزە.

**زلزله‌نگاری** / zelzelenegārî/: [عربی/ فارسی] /اسم. لەرزەنووسی؛ کار و ڕەوتی نیشاندانی هێـز، پەرە و بەرەوگەی شەپۆلی لەرە، بە لەرزەنووس.

**زلف** / zolf، ـها؛ ـان/: اسم. زلـف؛ زلـف؛ زولـف؛ زووف؛ بژی؛ گودلە؛ فـڕ؛ کـەزی؛ کەزیـە؛ تیـت؛ ئەگریجە؛ چینک؛ بسک؛ گیشک؛ قژی سەر.

⊡ **زلـف گذاشـتن**: زولـف هێـشتنەوە؛ زلـفەوە ئاسەی؛ درێژکردنەوەی مووی سەر.

**زلفی** / zolfî/ ☜ **زُلفین**

**زلفین** / zolfîn، ـها/: اسم. کلیـت؛ ڕزدە؛ ڕەزەن؛ گەو؛ قولف؛ زفرین؛ گۆلـە؛ ئالـقەی دەرگـا کـە شەوژەن یان زنجیری تێدەچێ: **زرفین**؛ **زلفی**

**زلم‌زیمبو** / zalamzîmbo, zalamzîmbo: ، ـها/: اسم. *[گفتاری]* زەڕ و زەنگیانە؛ متەومـووروو؛ هـەر چەشنە زێڕ و زیو ئاسای مەراش و کەمبایەخ.

**زله** / zelle/: [از عربی] ☜ **ذلّه**

**زمـام** / zemām, zamām ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ۱. هەوسـار؛ هەڤـسار؛ دەستەوسـار؛ ڕشـمـە؛ ڕەشمە؛ دەسـکەڕەشمە؛ جڵەو؛ پـەتێ کـە بـە لغاوەوە دەبەسـترێ تـاکوو سـوارکار، چـوارپێی بـاری یـان سـواری پـێ ڕابگـرێ و بیگـەڕێنێ ۲. *[مجازی]* دەسەڵات؛ ئیختیار.

⊡ زمام امور را به دست گرفتن: *[مجازی]* بوونـە ڕەحـیم سـاحێو مـاڵ؛ کـار و بـار بـە دەستەوەگرتن؛ ڕێبەری و بەڕێوەبەری کـار و باران بە دەستەوەگرتن.

**زمامـدار** / zemāmdār, zamāmdār ، ـها؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. دەسـەڵاتدار؛ ڕەمکـێش؛ کەسێ کە ڕێبەری و بەڕێوەبەرایەتی کار و بارێ بەتایبەت ڕێبەری دەوڵەتێکی بە دەستەوەیە.

**زمامداری** / zemāmdārî, zamāmdārî/: [عربی/ فارسی]/اسم. دەسەڵاتداری؛ کار و بار یان پیشەی دەسەڵاتدار.

**زمـان** / zamān ، ـهـا؛ أزمنـه/: اسـم. کـات؛ دەم؛ زەمان؛ زموون: ۱. وەخت؛ وەقـت؛ گـاڤ؛ گـام؛ گامە؛ گۆم؛ بەنگ؛ چاخ؛ دەمان؛ وەختان؛ هنگام؛ محەل؛ سەردەم؛ ڕەوتی لەگـەڕ و بـێبڕانـەوەی هەبوون، دیاردە و ڕووداوان ۲. وەخـت؛ وەقـت؛ گاڤ؛ گام؛ گامـە؛ گـۆم؛ بـەنگ؛ چـاخ؛ دەمـان؛ وەختـان؛ محـەل؛ سـەردەم؛ بەشـێکی دیـار و دابڕی ئەم ڕەوتە: *الف)* کە بە پێوەرێـک (چـەرخ، ساڵ، حەوتە، ڕۆژ، کاتژمێر و...) ئەنـدازە بگیرێـت *ب)* دەورە؛ دەوران؛ ڕۆژگار؛ ڕۆژگار؛ ڕۆژیـار؛ کـە هاوکاتـە لەگـەڵ ڕووداو یـان ڕووداوگـەلیـتردا ‹زمان جنگ: کاتی شەڕ› *ج)* کـە بـۆ کـار یـان چالاکییەکی دیاریکراو ڕەچاوکراوە ‹زمان کار: کاتی کار› ۳. *[دستور]* تایبەتمەنـدی کـردار کـە کـاتی ڕوودانی (لە ڕابردوو، ئێستا یان داهـاتوودا) پیـشان دەدا.

⊡ زمان تقویمی: زەمانێ کـە لـە بـزووتنی هـەر

گـەڕۆکێک بـە دەوری خـۆر، یـان مانـگ بـە دەوری گەڕۆکی خۆیدا، بە دی دێت.

**زمان‌بندی** / zamānbandî ، ـها/:/اسم. کـار یـان ڕەوتی دیاری‌کردن یان پێش‌بینی‌کردنی کـاتی پێویست بۆ جێبەجێ بوون یان بـەڕێوە چـوونی قۆناغگەلی جۆراوجـۆری گەلالـە، بەرنامـە یـان زنجیرەکارگەلێک.

**زمان‌سنج** / zamānsanc ، ـها/:/اسم. کـات‌بژێـر؛ کورنۆمیتر؛ ئامرازێ بۆ ژماردنی مەوداگەلی کاتی زۆر کورت.

**زمانمند** / zamānmand/: صفت. کاتبەر؛ کـاتگر؛ ماوەخایەن؛ پێویست بە ڕابردنی کـات ‹تحـصیل کاری زمانمند است: خوێندن کارێکی کاتبەرە›.

**زمانمنـــدی** / zamānmandî/:/اسم. کاتبـەری؛ کاتگری؛ دۆخ یان چۆنیەتی کاتبەر بوون.

**زمانـــه** / zamāne/:/اســم. دەوران؛ دەور؛ دۆر؛ چەرخ؛ ڕۆژگار؛ ڕۆچیار؛ زەمان؛ زەمانە؛ فەلـەک؛ فەلەک؛ دنیا؛ گەردوون ‹زمانه با تـو نـسازد، تـو بـا زمانه بساز!: دەوران بـە مـەیلی تـۆی نـەکرد، تـۆ بـە مەیلی دەوران بکە!›.

**زمـــانی** / zamānî/: صـفت. کـــاتی؛ زەمـــانی؛ سەردەمی؛ سەر بـە کـات یـان پێوەندیـدار بـە کاتەوە.

**زمپای** / zampāy/ ☜ **سرماپای**

**زمخت** / zomoxt ، ـها/: صفت. [گفتاری] قولـۆر؛ ناقۆلا؛ نەپۆڕ؛ دشت؛ بە پێکهاتەی نارێک‌وپێک و دوور لە وردی و جوانیەوە.

**زمختـــی** / zomoxtî/:/اسم. قولـۆری؛ نـاقۆلایی؛ نەپۆڕی.

**زمـــرد** / zomorrod/: [معـرب از یونـانی]/اسـم. زمـرووت؛ زمـرۆت؛ زامـرۆت؛ زامـڕووت؛ جـۆرێ بـەردی بـەنرخی کەسـک بـە بـڕێ ئوکـسید کرۆمەوە کە لە گەوهەرسازیدا بەکار دەچێ.

**زمردفام** / zomorrodfām/: [معرب/ فارسی] صفت. زامرووت‌واش؛ زمرۆت‌واژ؛ بە ڕەنگی زمرووت.

**زمردی** [1] / zomorrodî/: [معرب]/اسم. زمـرووتی؛ زامڕووتی؛ ڕەنگـی زەمـڕووت؛ ڕەنگـی سـەوزی ڕوون.

**زمردی** [2]: صفت. زمرووتی؛ زامڕووتین؛ بە ڕەنگـی زامڕووت؛ بە ڕەنگی سەوزی ڕوون.

**زمردین** / zomorrodîn/: [معرب/ فارسی] صفت. [ادبی] زمرووتی؛ زامڕوتین؛ زمڕووتین.

**زمره** / zomre/: [عربی]/اسم. ڕیـز؛ پێـڕ؛ چـین؛ تـاقم؛ پـۆل؛ دەسـتە؛ دەسـە؛ گـرۆ ‹در زمـرەی آزادیخواهان بود: لە ریزی ڕزگاریخوازاندا بوو›.

**زمزایی** / zamzāyî/ ☜ **سرمازایی ـ۲**

**زمزمه** / zamzame, zemzeme ، ـها/: [معـرب از فارسـی]/اسـم. ۱. مـۆرە؛ ویـرە؛ ویـر؛ مـۆر؛ لـۆرە؛ نارەنار؛ لۆرەلۆر؛ سۆزە؛ مۆرەمۆر؛ گۆرانییێ کە لـە بەر خۆوە بە دەنگی نزم دەخوێنـدرێ ۲. ورتـە؛ ورت؛ پرتە؛ پرتەپرت؛ ورتەورت؛ ڕێچـار؛ قـسەی لە ژێر لێوانەوە ‹از گوشەی اتاق زمزمەای بلند شد: لە کونجی دیوەکەوە ورتەورتێک هەسـتا› ۳. نارەنـار؛ وەیتە؛ ویر؛ مۆر؛ لۆرە؛ لۆرەلۆر؛ سۆزە؛ مۆرەمـۆر؛ هۆرە؛ هۆرەهۆر؛ ورنگەورنگ؛ ئاهەنگی بە دەنگی هێدی و دڵبزوێن و دڵـگرەوە ‹زمزمـەی بلـبلان: نارەناری بولبولان›.

▣ زمزمــه کــردن: مۆرەمـۆرکردن؛ هوربانـدن؛ نێورین؛ لۆراندن؛ بـە نەرمـە و لـە بـەر خـۆوە خۆندن.

**زمستان** / zemestān ، ـها/:/اسم. زسـتان؛ زسـان؛ زۆسان؛ زووسـان؛ زمـسان؛ زمـستان؛ زڤـستان؛ جسان؛ جستان؛ زم؛ زمستوو؛ زمسوو؛ زمـستون: ۱. یەکێ لە چوار وەرزی ساڵ لە سەرزەویگەلی ناوچەی مامناوندی، کە کەوتۆتە نێـوان پـاییز و بەهارەوە ۲. [کنایی] کژی سەرما و سۆڵە؛ وەرزی سەرما؛ چاخی سەرما ‹هنوز آذرمـاه نیامـده زمـستان شروع شده است: هێشتا سـەرماوەز نـەهاتووە زسـتان دەستی پێکردووە›.

▣ زمــستان هــسته‌ای: زسـتانی ئـەتومی؛ بـار و

دۆخێک کە ئەگەر شەڕی ناوکی بقەومێ، ڕوو دەدا و بە هۆی بەرز بوونەوەی تۆز و خۆڵی یەکجار زۆر، تیشکی خۆر ناگاتە زەوی و هەموو شوێنێک دەرچێ و ژیان دەپێچێتەوە.

**زمستان‌خوابی** / zemestānxābî/: *اسم. [زیست‌شناسی]* زستانەخەوی؛ چۆنیەتی بڕێ گیانەوەران کە لە زستاندا دەچنە خەو و لەم ماوەدا ڕادەی سووت و ساز و دەمای لەشیان دێتە خوارەوە، هەناسە و تەپەی دڵیان هێواش دەبێتەوە و بۆ درێژەدان بە ژیانیان لەو چەوریەی کە پێشتر لە لەشیاندا کۆ بۆتەوە، کەڵک وەردەگرن.

**زمستانی** / zemestānî/: *صفت.* زستانی؛ زمسانی؛ زۆسانی؛ زستانە؛ زستانەیی؛ زمسانە: ١. سەر بە زۆسان یان پێوەندیدار بە زستانەوە ‹هوای زمستانی: کەشی زستانی› ٢. شیاوی وەرزی زستان ‹لباس زمستانی: جل‌وبەرگی زستانی›.

**زمهریر** / zamharîr/: [معرب از فارسی] *اسم. [کنایی]* زمهەریر؛ زەمهەریر: ١. نەختە؛ زیک؛ ساواق؛ سەقەم؛ سەرما و سۆڵە؛ سەرمای تووش ٢. زۆزان؛ جێگای زۆر سارد.

**زمین** / zamîn/: *اسم.* زەوی؛ زەوین؛ زەمین؛ زەی؛ زەو؛ زەڤی؛ وەل؛ هارزەو: ١. هەرد؛ ئەرد؛ عەرد؛ ئەرز؛ هەرند؛ عەرز؛ قاد؛ کاد؛ قات؛ سەرزەوی؛ بەژ؛ وشکی؛ وشکانی؛ وشکایی؛ بەر و بووم؛ ئەو بەشە لە گۆی زەوی کە ئاو داینەگرتووە ٢. هەرد؛ ئەرد؛ عەرد؛ ئەرز؛ هەرند؛ عەرز؛ قاد؛ کاد؛ قات؛ سەرزەوی؛ بەژ؛ ڕووپەڕی دەرەکی بەشی نەگۆڕی هەر گەرۆک یان مانگێک ٣. بوو؛ بووم؛ ئەو گۆیە کە مرۆ بە سەریەوە دەژی ٤. /ها/ پارچەیێک لە زەوی کە هی کەسێکە و دەکرێ کشت و کاڵی تێدا بکا یان ماڵی لە سەر بکاتەوە ٥. *[مجازی]* تەختایی؛ تەختی دیو یان هەر شوێنێکی‌تر. بەرانبەر: **هوا** ‹توی تاکسی پول افتاد زمین و رفت زیر پای راننده: لە ناو تاکسیەدا پارەکە کەوتە زەوی و چووە ژێر پای ڕانندەکەوە› ٦. /ها/ گۆڕەپان؛ مەیدان؛ دەرەتانێ کە بۆ چالاکیەکی تایبەت دروست کراوە ‹زمین بازی: گۆڕەپانی کایە›.

▣ **زمین آبز:** زوهۆڕ؛ لەرزک؛ زنە؛ زناو؛ زەوینێ کە هەمیشە تەڕە و ئاو دەدەڵێنێ.

**زمین آبستە:** زەوینی کۆڵەوەس؛ زەوینی ڕەپستە؛ زەوینی ئاوەنیا؛ زەوی و زارێ کە ئاو دراوە و شۆکراوە و دوایی تووی لێ‌چێندراوە و ئامادەی ڕووان و بەر دانە.

**زمین آبی:** بەراو؛ بەراڤ؛ بەراوی؛ مەدرەب؛ زەوینێ کە ئاودێری دەکرێ.

**زمین باتلاقی:** زەلکاو؛ زەلکۆ؛ زەلکە؛ چارچیق؛ زۆنگ؛ قۆپی.

**زمین باز:** بەرایی؛ دەشت؛ گۆڕەپان؛ بەشێ لە زەوی کە ماڵ، دامەزراوە یان دار و کەژ و دیاردەی سروشتی تێدا نیە.

**زمین بازی:** گۆڕەپان؛ مەیدان؛ زەوی کایە؛ دەرەتانێ کە بۆ کایە تەرخان‌کراوە.

**زمین بایر:** بەون؛ بۆرە؛ بوور؛ بوورە؛ وەرد؛ بەیاز؛ بەیار؛ بایر؛ باهێر؛ کۆرە؛ کاش؛ مووش؛ دهم؛ زەوینێ کە خاوەنی هەیە، بەڵام هیچ جۆرە چالاکیەکی کشت‌وکاڵی، خانووسازی و پیشەیی تێدا ناکرێ.

**زمین بی‌گیاه:** کڕار؛ کڕاڵ؛ قاقڕ؛ بێ‌بڕ؛ ڕیتاڵ؛ کڕێل؛ کڕێن؛ وشکان؛ ڕووتەن؛ ڕووتاڵ؛ ڕووتەنی؛ گرکەزەوی؛ زەوینێ کە لەبەر بار و دۆخی سروشتی گژ و گیای لێ‌ناڕوێ یان زۆر کەم دەڕوێ.

**زمین پرحاصل:** نانگر؛ نانگیر؛ ماک؛ ماکە؛ نەخت؛ بەبڕشت؛ زەوی بەڕێژە؛ زەوی بە پیت

و ڕیژەو: **زمین حاصلخیز**

زمین پر گیاه و علف: بژوێن؛ زەمەند؛ بژون؛ زەوی پڕ لە گیا و لەوەڕ.

زمین چمن: چیمەن؛ مێرگ؛ چیمەن؛ زەوینی کایە کە ڕووەکەی بە چیمەن (سروشتی یان دەسکرد) داپۆشراوە.

زمین حاصلخیز ☜ **زمین پرحاصل**

زمین شهری: زەوی‌شاری؛ پارچە زەویگەلی لە سنووری قانوونی شار یان شارۆچکەیەک.

زمین موات: زەوی بێ‌خاوەن؛ زەمینی باهێر کە خاوەنی دیار نەبێ یان هەر بێ‌خاوەن بێ.

زمین ناهموار: هێری؛ زەوینی زورکانی بە کەند و لەند.

زمین هموار: هۆڕ؛ مەخەر؛ گوهۆڕ.

▣ زمین خوردن: کوترانە زەویدا؛ کەوتنە زەویدا؛ دریان بە زەویدا؛ کوتیانە عەرزا؛ دریانە زەویا؛ کەوتەی؛ زەمینەرەکوویەی: ۱. کەوتن؛ بە عەرزدا دان؛ گلیان؛ گلێرەی؛ گلێرای؛ بە توندیکەوە کەوتنە سەر زەوی یان تەختایی شتێک ‹دیروز موقع بازی زمین خوردم و پایم شکست: دوێنێ لە نێو کایەدا کەوتم و لاقم شکا›

۲. *[مجازی]* بەزین؛ بەزیان؛ بەزیای؛ دۆڕان؛ تێشکان؛ پشتدان؛ کۆڵدان؛ شکست خواردن ‹با این گشادبازی آخرش زمین می‌خورد: بەم گۆترەکاریەوە ئاخری تێدەشکێ›.

زمین زدن ☜ **به زمین زدن**

زمین گذاشتن: ۱. ☜ **به زمین گذاشتن** ۲. *[کنایی]* دانان؛ دەس لێ‌هەڵگرتن؛ دەس لێ‌کێشان؛ لێ‌گەڕان؛ واز لێ‌هێنان؛ بەجێ هێشتن؛ دەس چنە ئاسەی؛ واز چنە ئاردەی؛ دەس چەنە کێشای ‹چند ماه است سیگار را زمین گذاشته: چەند مانگێکە جگەرەی داناوە›.

زمین ماندن: *[کنایی]* داکەوتن؛ داکەفتن؛ هەر وا مانەوە؛ بە دەسەوە مان؛ ئەوەمەنەی؛ بێ‌داپەڕ بوون ‹همەی کارها زمین مانده و تو می‌خواهی بروی گردش؟: گشت کارەکان داکەوتووە و تۆ دەتەوێ بچی بۆ سەیران؟›: **بر زمین ماندن** *[ادبی]*

زمین و آسمان/ زمان را به هم دوختن: *[مجازی]* لە دار و بەرد دان؛ شان و قۆڵ کوتان؛ زەوین و ئاسمان بە یەکا دان؛ دنیا دان بە یەکدا؛ تەق و دەوکردن؛ هەوڵ و تەقالای زۆر دان ‹برای نجات پسرش زمین و آسمان را به هم دوخت: بۆ ڕزگارکردنی کوڕەکەی لە دار و بەردی دا›.

از زمین **بلند** کردن: ۱. هەڵگرتن؛ بەرزەو کردن؛ هۆربرنەی؛ زەمینەنە هۆرگێرتەی؛ شتێکی (زۆرتر) قورس لە سەر زەویەوە بەرزکردنەوە ۲. ڕاستکردنەوە؛ ڕاسەوە کەردەی؛ هەڵستاندنەوە؛ شتێ کە لە سەر زەویدایە ڕاستکردنەوە ۳. *[کنایی]* دەس‌گرتن؛ یارمەتی دانی کەسێکی داماو بە پشتگری یان پارە.

**از زمین تا آسمان فرق داشتن:** *[کنایی]* ئاسمان و زەوی بوون؛ زۆر جیاواز بوون؛ کوجا بر کوجا بوون.

از زمین **درآمدن**: ۱. سەوز بوون؛ شین بوون؛ سەرهەڵدان؛ ڕوان؛ ڕسەی ۲. دەرهاتن لە ژێر زەویەوە؛ لە بن زەویەوە دەرهاتن؛ زەمینەنە بەرئامەی؛ لە زەویدا هەڵێنجران. هەروەها: **از زمین درآوردن**

بر زمین ماندن ☜ **زمین ماندن**

به زمین **افتادن**: داکەوتن؛ داکەوتنە زەوی؛ کەوتنە سەر ئەرز؛ بە زەمیندا کەوتن؛ ئەرەزەمین‌کەوتەی؛ کەوتەیرە زەمین ‹از اسب به زمین افتاد: لە ئەسپەوە داکەوت›.

به زمین **انداختن**: داخستن؛ خستنە بان زەوی؛ ئەرەزەمین وسەی؛ وستەیرە زەمین؛ شتێ بەردان تا دەکەوێتە سەر زەوین ‹چوب را به

زمین انداخت: چێوەکەی داخست›.

**بە زمین زدن:** لەپتاندن؛ لە ئەرز دان؛ بە زەویدا دان: ١. دانە زەویدا؛ کوتانە زەویدا؛ شتێک یان کەسێک خستنە سەر زەوین ٢. *[مجازی]* بەزاندن؛ تێشکاندن ❋ **زمین زدن** *[گفتاری]*

**بە زمین گذاشتن:** دانان؛ دانیان؛ نیانە زەوی؛ ئەرەزەمین نیەی؛ نیایرە زەمین؛ لە سەر زەوین دانیان ‹توپ را بە زمین گذاشت: تۆپەکەی نایە زەوی›: **زمین گذاشتن**

**زمین بازی** / zamînbāzî/: *اسم. [مجازی]* کار یان ڕەوتی کڕین و فرۆشتنی زەوی (بەتایبەت زەوینی دەور و بەری شاران) بۆ بردنە سەرەوەی بایی و وەدەس خستنی قازانجی زۆرتر.

**زمینخوار** / zamînxār ، ـها؛ ـان/: *اسم. [مجازی]* زەویخۆر؛ کەسێ کە زەوی بۆ ماڵ یان کشتوکاڵ لە ڕێی ناڕەواوە داگیر دەکات.

**زمین‌خورده** / zamînxorde ، ـها/: *صفت. [مجازی]* لێقەوماو؛ کەوتوو؛ کەفتە؛ قوڕەماو؛ کلۆڵ؛ داماو؛ نوشستهێناو ‹بە آدمهای زمین‌خوردە باید کمک کرد: دەبێ یارمەتی مرۆی لێقەوماو بدرێ›.

**زمیندار** / zamîndār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* زەویندار؛ زەمیندار؛ مەزراوان؛ خاوەنزەوی؛ کەسێ کە زەوینی کشتوکاڵی هەیە.

**زمینریخت** / zamînrîxt/: *اسم. [زمین‌شناسی]* نژمی زەوی، پێکهاتە و چۆنیەتی جێگرتنی ئاو، بەژ و کەند و لەندگەلی زەوی.

**زمینریخت‌شناسی** / zamînrîxtšenāsî/: *اسم. [زمین‌شناسی]* لقێک لە زانستی زەویناسی کە دەپەرژێتە سەر چاڵوچۆڵی، بەژ و ئوقیانووسگەلی زەوی و هۆی بەدیهاتنیان.

**زمینزی** / zamînzî/: *صفت.* زەویژی؛ بەتایبەتمەندی یان خووی ژیان لە سەر زەویندا.

**زمینساخت** / zamînsāxt/: *اسم.* لقێک لە زەویناسی کە لە سەر پێکهاتەی چین و لۆی نەگۆڕی زەوی و هێز و بار و دۆخگەلێ کە دەبێتە هۆی جم و جوولی (وەک پەیدا بوونی کێو، بوومەلەرزە و کەندولەند) باس دەکا.

**زمین‌سنجی** / zamînsancî/: *اسم.* زەوی پێوی؛ کار و ڕەوتی لێکۆڵینەوە لە شێوە و ئەندازەی زەوی بە وردی و دیاریکردنی هەر خاڵێک لە سەریەوە.

**زمین‌شناس** / zamînšenās ، ـان/: *اسم.* زەویناس؛ کەسێ کە لە پێکهاتەی زەوی و چۆنیەتی دروست بوونی بەردگەل شارەزایە.

**زمین شناسی** / zamînšenāsî/: *اسم.* زەویناسی؛ زانستێ کە لە پێکهاتە و سەربهوردی زەوی بەتایبەت بە سەرنج دان لە سەر بەردگەل و پێکهاتەی ئێستایان دەکۆڵێتەوە.

**زمین شیمی** / zamînšîmî/: [فارسی/ فرانسوی] *اسم.* زەویشیمی؛ زانستێ کە لە پێکهاتە و گۆڕانکاری کیمیایی بەشی نەگۆڕی زەوی دەکۆڵێتەوە.

**زمین فیزیک** / zamînfîzîk/: [فارسی/ فرانسوی] *اسم.* زەویفیزیک؛ زانستێ کە لە سەر ڕەوتانەگەلی ماکی زەوی، وەک هەوا، ئاو، بوومەلەرزە، گڕکان، شوێنەواری میغناتیسی و ڕادیۆئەکتیڤ دەکۆڵێتەوە.

**زمینگرا** / zamîngerā/: *صفت. [زیست‌شناسی]* بەتایبەتمەندی گەشەکردن و لارەو بوون بەرەو زەوی.

**زمین‌گرایی** / zamîngerāyî/: *اسم. [زیست‌شناسی]* ڕەوتی گەشەکردن یان خوار بوونەوە بەرەو زەوی، بەتایبەت لە گژ و گیادا.

**زمینگیر** / zamîngîr/: *صفت. [مجازی]* زەوینگیر؛ زەمینگیر؛ لێککەوتوو؛ لێکەفتگ؛ پەککەوتە؛ کەلەلا؛ لاکەفتە؛ تەختی؛ گونوولە؛ گولۆلە؛ شەهتی؛ ناکارا لە جمشت، بەتایبەت لە بەر

نەخۆشی یان کزی ‹پس از آن حادثه یک سال زمینگیر شد: دوای ئەو ڕووداوە سالێک زەوینگیر بوو›.

**زمینلاد / zamînlād**/: اسم. بەژایی؛ پانایییەکی گەورە و بەرین لە وشکی کە بریتیە لە زۆربەی خاکی ولاتێک و زۆرتر لە بەرامبەر دورگەوە بە کار دێ.

**زمینلرزه / zamînlarze**، ـها/: اسم. بوومەلەرزە؛ بووەلەرزە؛ زەولەرزە؛ زەمینلەرزە؛ لەرزەک؛ لەرەی ناکاوی بەشێک لە توێکلی زەوی.

**زمینلغزه / zamînlaqze**، ـها/: اسم. گندر؛ دیاردەی بەر بوونەوە و گندرین و کۆما هاتنە خوارەوەی بەرد و خۆڵ.

**زمینوار / zamînvār**/: صفت. زەویناسا: ۱. بە بیچمی گریمانی گۆی زەوی جگە لە کەند و لەند و چاڵ و چۆڵیگەلی ۲. بە بیچمی گۆی ناتەواو، وەک گۆی زەوی.

**زمینه / zamîne**، ـها/: اسم. ۱. ژێرنەخش؛ تەخت؛ تەختە؛ مەتن؛ بنەکوک؛ ئەو بەشە لە چنراوە یان وێنەیەک کە کەوتۆتە دەوراندەوری نەخشەوە ‹نقاش دختری را در زمینهٔ جنگل انبوهی کشیده بود: شێوەکێش کیژێکی لە ژێرنەخشی لێڕەوارێکی چڕدا کێشا بوو› ۲. پێکهاتە؛ بار و دۆخی ڕەخساو بۆ ڕوودانی ڕووداوێ یان جێبەجێکردنی کارێک ‹زمینهٔ این کار از قبل فراهم شده بود: پێکهاتەی ئەم کارە لە پێشەوە پای کەوتبوو› ۳. *[مجازی]* مەبەست؛ بوار؛ بابەتی کار یان ڕووداوێ ٤. *[زمینشناسی]* شانە؛ بنەکوک؛ ئەندازە، شێوە و ڕیزی جێگرتنی کانیگەل لە بەردا.

◻ زمینه داشتن: ۱. ئەگەری سەرکەوتن هەبوون ۲. بەرهەڤ بوون؛ تەیار بوون. هەروەها: **زمینه فراهم کردن**

**زمینەچینی / zamînečînî**، ـها/: اسم. ڕێخۆشکەری؛ کار یان ڕەوتی بەرهەڤکردنی پێشەکی بۆ جێبەجێکردنی کارێک.

**زمینەساز / zamîneāz**/: اسم. ڕێخۆشکەر؛ ڕێکخەر؛ ئەوی کار، ڕەوت یان دۆخێ دابین دەکا ‹جنگ زمینەساز ثروتهای بادآورده شد: شەڕ بوو بە ڕیخوشکەری سامانگەلی مفت و مەرحەبا›.

**زمینەسازی / zamînsāzî**، ـها/: اسم. ڕێخۆشکەری؛ کار یان ڕەوتی دابینکردنی پێداویستی یان بار و دۆخی لەبار بۆ دەسپێکردنی چالاکی یان کارێک.

**زمینی / zamînî**/: صفت. زەوینی؛ زەمینی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە زەوی ‹محصول زمینی: داهاتی زەمینی› ۲. پێوەندیدار بە گۆی زەویەوە ‹موجود زمینی: بوونەوەری زەوینی› ۳. بەژی؛ پێوەندیدار بە وشکیەوە ‹نیروی زمینی: هێزی زەوینی›.

**زن** [1] / **zan**، ـها؛ ـان/: اسم. ژن؛ ژەنی؛ زە؛ زینە؛ پیرەک؛ پنکۆ؛ پتۆ: ۱. ئافرەت؛ عافرەت؛ مرۆی مێوینەی پێگەیشتوو ‹همه از زن و مرد در انتخابات شرکت کردند: هەموو بە ژن و پیاوەوە لە هەڵبژاردندا بەشداریان کرد› ۲. هاوسەری پیاو؛ هاوژینی پیاو؛ ئاوجووت؛ هامجووت ‹زن همسایەمان مریض است: ژنی دراوسێکەمان نەخۆشە› ۳. مرۆی مێوینە کە مێردی کردووە ‹زن بیوه: ژنی بێوە›.

◻ زن پای در زنجیر: ۱. *[نجوم]* ژنی کۆت لە پا؛ وێنەیەکی ئاسمانی باکووری ۲. هەورێکی مارپێچی ڕووناک لەو وێنەدا ❋ **المرأه المسلسله؛ امرأه المسلسله؛ مرأه المسلسله**

**زن خانه**: کابان؛ کەیبانوو؛ کەیوانوو؛ کەیوانە؛ کەبانی؛ ژنی ماڵ؛ ژەنۆ یانەی؛ بنەوان؛ بنەوانە؛ ژنێ کە بەڕێوە بردنی کار و باری نێو ماڵی لە ئەستۆدایە.

◻ زن بردن: *[گفتاری]* ژن خواستن؛ ژن هێنان؛ ژەن واسەی؛ ژەن ئاردەی ‹آزاد از ده ما زن برده است: ئازاد لە دێی ئێمە ژنی خواستووە›.

**زن دادن**: ژن پێدان؛ ژن دان؛ ژەن دەی؛

ژەن داپنەی؛ ژنێ کردنە هاوسەری پیاوێک ‹آنها بە غریبە زن نمی‌دهند: ئەوان ژن نادەنە بێگانە›.

**زن گرفتن:** ژن هێنان؛ ژن خواستن؛ ژن هاوردن؛ ژن ئانین؛ ژەن ئاردەی؛ زەماوەن‌کردنی پیاوێ لەگەڵ ژنێکدا ‹امسال برای پسرش زن گرفت: ئەمساڵ ژنی هێنا بۆ کوڕەکەی›.

**ـ زن**[2]: *پیواژە.* ـ لێدەر: ١. ـ ژەن؛ ـکوت؛ ـکۆ؛ ژەنیار؛ ئەوەی کە لێدەدات (بۆ ئامێری مووسیقا) ‹دُهُل‌زن: دەوڵ‌ژەن› ٢. ـ وەشێن؛ ـ شان؛ ـ شەن؛ ئەوەی کە لێ‌ئەدات ‹شمشیرزن؛ خشت‌زن: شیروەشێن؛ خشت‌لێدەر› ٣. ـ ژەن؛ ـ ژێن؛ ڕاتلەکێن؛ ئەوەی کە دەژەنێت ‹مَشک‌زن: مەشکەژەن›.

**زن آقا** / zanāqā/: [فارسی/ مغولی]*اسم. [گفتاری]* ١. سەیژن؛ ژنێ کە هاوسەری پیاوی سەیدە ٢. سەیزادە؛ سەیزا؛ ژنێ کە سەید بێت.

**زنا** / zenā/: [عربی]*اسم. [اسلام]* زینا؛ زیناح؛ زیناع؛ زەنی؛ تێکەڵاوی ژن و پیاوێ کە هاوسەری یەک نین. هەروەها: **زنا کردن**

▣ **زنای مُحصِنه:** *[اسلام]* تێکەڵاوی لەگەڵ هاوسەری کەسی‌تر.

**زناشوئی** / zanāšû'î/ ☜ **زناشویی**

**زناشویی** / zanāšûyî/: *اسم.* هاوسەری؛ ژن‌ومێردایەتی؛ ژن‌ومێردی؛ کار و ڕەوتی بوونە هاوسەری یەکتری ژن و پیاو: **زناشوئی**

**زناکار** / zenākār ، ـان/: [عربی/ فارسی]*اسم. [اسلام]* زیناکار؛ زیناح‌کار؛ زیناع‌کەر؛ زەنی‌کەر؛ کەسێ کە زینا دەکات.

**زناکاری** / zenākārî/: [عربی/ فارسی]*اسم. [اسلام]* زیناکاری؛ تێکەڵاوی ژن و پیاوێک کە ژن و شووی یەک نین.

**زنانگی** / zanānegî/: *اسم.* ژنایەتی؛ ژنەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هەبوونی تایبەتمەندیگەلی ژنانە.

**زنانه** / zanāne/: *صفت.* ژنانە؛ ژەنانە: ١. سەر بە ژنان یا تایبەت بە ژنان ‹پیراهن زنانه: کراسی ژنانە› ٢. وەک ژنان ‹رفتار زنانه: ئاکاری ژنانە›.

**زنانه‌دوز** / zanānedûz ، ـها؛ ـان/: *صفت.* ژنانەدوور؛ دوورێنی جل‌وبەرگ و پێڵاو و کیفی ژنان.

**زن‌بابا** / zanbābā ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* باوەژن؛ باوەژەنی؛ زڕدایک؛ ژنباڤ؛ ژنی باوک.

**زنبارگی** / zanbāregî/: *اسم.* ژنبازی؛ تۆلازی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لە شوێن ژنان بوون.

**زنباره** / zanbāre ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* ژنباز؛ تۆلاز؛ ئۆگری ئەوینداری و هاوئامێزی‌کردن لەگەڵ ژنان: **زنباز**

**زنباز** / zanbāz/ ☜ **زنباره**

**زن‌برادر** / zanbarādar ، ـها/: *اسم.* براژن؛ براژەنی؛ ژنی‌برا؛ زورار؛ ژنی‌تی.

**زنبق** / zambaq, zanbaq ، ـها؛ ـان/: [معرب از فارسی]*اسم.* لەیلانک؛ زەمبەق؛ زەمەق؛ گوڵ‌زیوا؛ گالر: ١. گیایەکی ڕازێنەیی لە تیرەی زەمبەقان، بە لاسکی قیت و گەڵای کەسکی تۆخی خەنجەرئاسا و گوڵی نارێک‌وپێکەوە ٢. گوڵی ئەو گیایە کە گەورە و سپی، وەنەوش یان زەردی بۆنخۆشە و چەند جۆری هەیە.

**زنبور** / zambûr, zanbûr ، ـها؛ ـان/: [عربی]*اسم.* زەرگەتە؛ زەرگیتە؛ زەرگێتە؛ زلگێتە؛ زلکیتە؛ زرکتک؛ ئەستنگ؛ مووز؛ سێو؛ ناوی گشتی هەر یەکە لە گرۆی زەرگەکان، لە ڕاستەی ناسکباڵان، بە لەشی خڕ و لووس، دەمێ کە شتی پێ هەڵدەمژن یان ورد دەکەن و چز و باڵەوە، زۆربەیان گیاخۆرن و ژیانی بە کۆمەڵیان هەیە.

▣ زنبور زرد: شاندەلیک؛ ستانگ؛ ستەنگ؛ گونجەزەردە؛ زەردەواڵە؛ زەرگەتە؛ زەنگەتە؛ زلقتی؛ زڕقتک؛ زەرگەتەیەکی چکۆلەی چزدارە پێوەدەدا.

زنبــور ســرخ: ژەنگەســوورە؛ زەنگــەزمرە؛ ســیرەمۆزە؛ ســیرەمووزە؛ ســوورەمۆزە؛ ســوورەمزە؛ ســوورپیازە؛ شەنگەســوورە؛ کونجەسورخە؛ زڤــرک؛ ســینلگ؛ ســتەنگ؛ ســتانگ؛ زەرگەتەیــەکی ســوورە و زەردی چزووداره و له زەرگەتەی ئاسایی زلترە.

زنبور سیاه: شەمەترێلکە؛ بەدرەمە؛ شابەردەمە؛ ڕیڤۆک؛ جۆرێ زەرگەتەی ڕەشی کولکن، که بێچووەکانیان مێملی میروانی‌ترن.

زنبــور طلایــی: جــۆرێ زەرگەتــه بــه پێــستی ڕەنگامەی بریقەدارەوە که ژێر سکی تەختــه و له ناو شانەی هەنگ و زەرگەتە کێویدا هێلانه دەکا.

زنبــــور عــــسل: هــــەنگ؛ مێــــشەنگوێن؛ مــــێش‌هــــەنگوێن؛ مێــــشی هــــەنگوێن؛ مــێش‌هــەنگوڤ؛ مێــشەنگڤ؛ کاوێنــەمێش؛ مێشەهەنگ؛ مێــشەنگ؛ مــێش؛ میــسەسەڵ؛ وەوە؛ جۆرێــک زەرگەتــه کــه زەرد و ڕەش و قــاوەیی و تەنانــەت تــەلایی و دوو ڕەنگیــشی هەیە، به کۆمەڵ دەژین و له شــیرەی گــوڵ و گیا هەنگوین دروست دەکەن.

زنبــور عــسل ملکــه: مــاک؛ ماکــه؛ شــاهەنگ؛ سەرەهەنگ.

⊡ زنبــور زدن: زەرگەتــه پێــوەدان؛ زەردەواڵــه پێوەدان؛ زەردەواڵەگەسەی؛ هەنگەژاڵــه دانــه قەدەو ‹زنبور دستم را زد، این‌قدر باد کرد: زەردەواڵه پێوەی دام، ئەمەندە دەستم پەنەما›.

**زنبورخــوار** / zambûrxār, zanbûr- ، ـها؛ ـان/: [عربــی/ فارســی]/اســم. حەوڕەنگیلــه؛ ڕەنگــڕێژە؛ هــەفتڕەنگیلــه؛ مــێش‌خــۆرە؛ هەنگــەخۆرە؛ هەنگەچنە؛ هەنگەچین؛ پەلەوەرێکی کۆمەڵژی، به جەستەی باریک، باڵی درێژ و نووک‌تیژ، کلک و دەنووکی درێــژ و باریکــەوە کــه لــه مێــرووان دەخوا.

**زنبــورداری** / zambûrdārî, zanbûr- ، ـهــا/: [عربی/ فارسی]/اسم. هەنگداری؛ کــار یــان ڕەوتی پەروەردەکردن و بەخێوکردنی مێــشەنگوێن بــۆ بەرهەم هێنانی هەنگوین.

**زنبورک** / zambûrak, zanbûrak ، ـها/: [عربــی/ فارسی]/اسم. ۱. ســازێکی ژێــداری وەک چــەنگی زۆر چکۆلەیە که لــه نێــوان ددانی دەنــێن و بــه لێدانی له زوانەیێکی کــانزایی و هێــزی هەناســه دەژەنرێ ۲. جۆرێ تۆپی چکۆلەی کۆن کــه لــه شەڕدا به سەر وشترەوە دەیانبرد.

**زنبــوری** / zambûrî, zanbûrî/: [عربــی]/اسم. ۱. قوماشــی تــۆڕی درشــتچــن ۲. چراتــۆڕ؛ چراتۆڕی؛ جۆرێ چرای ڕوشنایی به نەوت‌سووت که له جێــی پــلێتە، تــۆڕێکی نەســۆتی هەیــه و نەوت به تەوژمەوە وەکوو تۆز پێیدا دەپژرێــت و به تیشکی سپی دەگرێ.

**زنبه** / zambe, zanbe ، ـها/: اسم. زەمە؛ زەممــه؛ زمبەر؛ ناوە؛ دەفرێکی چوار گۆشی لێوارە کــورت بــه چــوار دەســته لــه هــەر دوو لاوە کــه مــاکی ماڵسازی پێ جێبەجێ دەکەن.

**زنبیل** / zambîl, zanbîl ، ـها/: اسم. ۱. زەمیلــه؛ زەمبیله؛ زەمبیــل؛ زەنبیــل؛ دەسکلە؛ چنگــڵه؛ خانــک؛ گۆشــەر؛ قەوشــەر؛ تلــۆخ؛ بەرچینــه؛ دەسەچینە؛ کەتلە؛ دەفرێکی نــەرمی چنــراو لــه لاســکە گیــا، نــایلۆن یــان ســیم، بــه دەســتەی درێژەوە کــه بــۆ هەڵــگرتن و جێبــەجێ‌کــردنی کەلپەل بەتایبەت له کاتی کڕیندا به کار دەچــێ ۲. *[مجازی]* تریــان؛ قەرتاڵــه؛ قرتاڵــه؛ ســەوەتە؛ سەلە؛ سەلک.

**زنبیلک** / zambîlak, zanbîlak/ ☜ **راهبَند ـ۳**

**زن‌پدر** / zanpedar ، ـها/: اسم. داماری؛ دامــاک؛ زڕدایک؛ باوەژن؛ باوەژەنی؛ ژنبانی.

**زنجــار** / zancār ، ـهــا/: [معرب از فارســی]/اسم. ژەنگ؛ ژەنگار؛ خۆرک؛ خۆسەرە؛ چلک و ژەنگی سەر کانزا.

**زنجبیل** / zancabîl ، ـها/: [معــرب از فارســی]/اسم.

هەلەزە؛ زەنجەفیڵ؛ زەنجەفیل؛ گیایێکی ئالفی، بە گەڵای ساکاری درێژ و لە دووی یەک، گوڵی نێر ـ مێی نارێک و زەرد، ڕیزۆمی گۆشتنی بۆنخۆشی تام تیژەوە کە لە پاش وشک‌کردنەوە وەک بەهارات بە کاری دێنن.

▣ **زنجبیل شامی**: خەرواش؛ گیایێک بە ڕیشووی قایم و درێژ و گۆشتن، لاسکی ڕێک و لق‌لق، گەڵای نووک تیژ و تووکن، گوڵی زوانەیی و لوولەیی زەرد و بەری قاوەیی ڕەنگەوە، بۆ دەرمان بە کەڵکە.

**زنجره** / zancare ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* بەرزەچڕ؛ چیچڕک؛ چرچرۆ؛ چیرچیرۆک؛ سیسۆک؛ سیسۆکە؛ سیرسیرە؛ شیرشیرە؛ مێرووییەکی گچکەیە بە شاخێکی درێژی وەک موو لە نێو چاوان و ئەندامی دەنگ چێکەر لە لای سکیەوە.

**زنجموره** / zanc(e)mûre/: [؟]*اسم. [گفتاری]* کرووزە؛ گریانی هاوڕێ لەگەڵ هاوار و ناڵیندا.

**زنجمویه** / zancemûye/: [؟]*اسم. [ادبی]* کرووزە؛ ڕۆ ـ ڕۆ؛ شین و شەپۆڕ؛ گریانی بە کرووزانەوە.

**زنجیر** / zancîr ، ـها/: [از کردی]*اسم.* ١. زنجیر؛ زەنجیر؛ زنجیلە؛ ئالقەڕیز؛ زریزە؛ زرێ؛ گەڵوازەیەکی کانزایی پێکەوە لکاو بۆ بەستن، هەڵواسین و گۆزانەوەی هێزی میکانیکی یان (بە جۆرێکی تر) بۆ خشڵ و زەمبەر بە کار دێ ٢. زنجیر؛ زەنجیر؛ زنجیلە؛ چەن ڕیسە ئالقەی ناسکی پێکەوە بەسراو کە لە ڕێوڕەسمی زنجیر لێداندا بە کار دێ ٣. *[مجازی]* پابەند؛ پاوەن؛ کۆسپ؛ لەمپەر؛ گەپل؛ بەرهەڵست.

▣ **زنجیر چرخ**: زەنجیری چەرخ؛ زنجیرێ کە لە کاتی بەستەڵەکدا بۆ بەرگری لە خزین، بە چەرخی ماشینیەوە دەبەستن.

▣ **زنجیر پاره کردن**: *[کنایی]* ١. چاو دەرپەڕین؛ هەڵپفان؛ کەف چەراندن؛ زۆر توورە بوون ٢. پەت برین؛ پەت پساندن؛ هەردی بوون؛ دانە کێو؛ شێت بوون.

**زنجیر زدن** ☜ **زنجیرزنی**

**زنجیر کردن**: زەنجیرکردن؛ بە زەنجیر بەستن.

**به زنجیر کشیدن**: کۆت و زنجیرکردن؛ پاوەن کردن؛ بۆ بەرگری لە هەڵاتن بە زەنجیر بەستنەوە ‹در این عکس میرزا رضای کرمانی را می‌بینیم که به زنجیر کشیده شده است: لەم وێنەیەدا میرزا ڕەزای کرمانی دەبینن کە کۆت و زەنجیر کراوە›.

**زنجیرزنی** / zancîrzanî ، ـها/: *اسم. [شیعه]* جۆرێ ڕێوڕەسمی تازیەباری بەتایبەت لە مانگی محەڕەمدا کە تازیەباران بە زنجیر پەیتا ـ پەیتا ناو شانی خۆیان دەکوتنەوە. هەروەها: **زنجیر زدن**

**زنجیره** / zancîre ، ـها/: *اسم.* زنجیرە: ١. شریتە؛ ئەوەی لە بیچمی زنجیر بێ ٢. چەرخە؛ خول؛ گەڵوازە؛ گاز؛ کار و ڕەوتگەلی پێوەندیدار پێکەوە ‹زنجیرەی تولید: زنجیرەی بەرهەم› ٣. گرنج؛ هێڵگەلی لێوارەی سکە ٤. ئالقەگەلی لە شوێن یەکی وەک زنجیر لە چنیندا، بەتایبەت قولاب‌چنی ٥. تاڵی گولابتوون یان ئاوریشمی چندراو بە شێوەی زنجیر لە پەراوێزی جل‌وبەرگدا.

▣ **زنجیره‌ی غذایی**: زنجیرەی بژیوی؛ زنجیرە پلەی گیاندارانی دەڤەرێکی سروشتی کە هەر ڕەگەزێ لە ژینەوەران، ڕەگەزی‌تر دەخوا و دەیکاتە بژیوی خۆی.

**زنجیره‌ای** / zancîre'î/: *صفت.* زنجیرەیی؛ زنجیرەدار؛ بە بیچم یان دۆخی زنجیرەوە، بەتایبەت بە یەک لە شۆن یەکی و بەردەوامی یان پێک پێوەندیەوە.

**زنجیری** / zancîrî/: *صفت.* پەتبڕ؛ زەنجیری؛ دەس‌وەشێن؛ شێتی بەترەف کە پێویستە دەست و پای ببەسترێتەوە

**زنخ** / zanax/:اسم. [ادبی] زنـج؛ زەنـج؛ ئـەرزەن؛ ئەرزنک؛ ئەرزینگ؛ ئارزینگ؛ چەن؛ چەنە؛ چانە؛ چەنەگـە؛ چەناگـە؛ چناکـە؛ چـەناکێ؛ چـەناخ؛ ئاگرگوشـک؛ خـوارترین بەشـی دەم و چـاو بـە شێوەی دەرپەڕیویەک لە شەویلاکی ژێرووداّ.

**زنخـدان** / zanaxdān/:اسـم. [ادبـی] چنـاوە؛ چەناگە؛ چناکە؛ چەنەگە؛ چاڵی چەنە.

**زن‌داداش** / zandādāš ، ـها/: [فارسی/ ترکی] اسم. [گفتاری] براژن؛ براژەنی؛ ژن‌تی؛ ژنی برا.

**زندار** / zandār ، ـها؛ ـان/: اسم. [گفتاری] ژنـدار؛ ژەندار؛ پیاوێ کە ژنی هەیە و سەڵـت و سـپات نیە.

**زنـداری** / zandārî/: اسـم. زنـداری؛ ژەنـداری؛ لێهاتوویی و توانایی ژندار بوون ‹این رسـم زنـداری نیست: ژنداری وا نابێ›.

**زنـدان** / zendān ، ـهـا/: اسـم. زینـان؛ زنـدان؛ زینـــدان: ۱. بەنـــد؛ بـــەن؛ دامـــەزراوەییک بـــۆ ڕاگـــرتنی بـــە زۆری تاوانبـــاران یـــان بـــەرتاوانان ۲. بەندیخانە؛ گرتیخانە؛ گرتووخانە؛ گرتیگەهـ ؛ دوساخ‌خانە؛ بەیخانە؛ حەپس؛ قەڵا؛ قولیک؛ ماڵ یان بینایەک کە بۆ ئەم مەبەستە تـەرخان‌کـراوە ۳. شوێنێ کە کەسێ بێ‌ویـستی خـۆی دەوێـدا ڕادەگـیردرێ و لـە هاتنـە دەرەوەی بـەرگری دەکرێ.

◙ زندان ابد: حبس ابد ☜ **حبس**

زندان سکندر: ۱. زیندانی ئەسکەندەر؛ شوێنی زۆر تاریک و خۆفنـاک و نـاخۆش ۲. [قـدیمی] لەقەبی شاری یەزد لە کۆندا.

زندان مجرّد: حبس انفرادی ☜ **حبس**

◙ بە زندان افتـادن: کەوتنـە زینـدان؛ کەفتنـە زینـــدان؛ بەنـــدکران؛ خرانـــە بەندیخانـــەوە؛ زیندانی بوون. هەروەها: **بە زندان انداختن**

**زنـــدانبان** / zendānbān ، ـهـا؛ ـان/: اسـم. زیندانـــەوان؛ زینانـــەوان؛ زینـــانوان؛ وەردیـــان؛ بەنـدیوان؛ بـەنگیوان؛ دوساخچی؛ چـاوەدێر یـا کارگێڕی بەندیخانە.

**زنـدانی**[1] / zendānî ، ـهـا؛ ـان/: اسـم. بەنـدی؛ بەنگی؛ زیندانی؛ زینانی؛ زندانی؛ وەنـێ؛ سـنی؛ گراو؛ گرتوو؛ کەسێ کـە لـە بەندیخانـەدا ڕاگـیر دەکرێ ‹امـروز سـە زنـدانی آزاد شـدند: ئـەوڕۆ سـێ بەندی بەردران›.

◙ زندانی سیاسی: زیندانی سیاسی؛ کەسـێ کـە بە هۆی بیر و بۆچوونیەوە گیراوە.

◙ زندانی شدن: زیندانی بوون/ کران؛ لـە بەنـد گیران؛ بەندکران؛ لە بەندیخانـەدا ڕاگـیردران ‹چهار مـاه در تبریـز زنـدانی شـد: چـوار مانـگ لـە تەورێزدا زیندانی بوو›.

**زندانی**[2]: صفت. بەنـدی؛ بـەنگی؛ گرتـوو؛ گـراو؛ دیل؛ گیراو؛ زیندانی؛ زینـانی؛ زنـدانی؛ گـیراو و چاودێری لێکراو لە بەندیخانەدا ‹آزاد هم سە سـال در اینجا زندانی بود: ئازادیش سێ ساڵ لێرەدا زیندانی بوو›.

**زن‌دایـــی** / zandāyî ، ـهـا/: اسـم. خاڵـۆژن؛ لالۆژەنی؛ زنالۆ؛ ژن‌خـاڵ؛ ژنی‌خـاڵ؛ هاوسـەری خاڵ.

**زندگانی** / zendegānî ، ـها/: اسم. [ادبـی] ژیـان؛ ژیـن؛ ژی؛ ژیـوەی؛ ژیـوای؛ ژیـوار؛ زینگـانی؛ زینگی؛ جیو.

**زندگی** / zendegî ، ـها/: اسم. ژیـان؛ ژیـن؛ ژی؛ ژیوەی؛ ژیوای؛ زنـەگی؛ زنـەیی؛ جیـو؛ زینگـی؛ زینگانی؛ زیندەگی؛ زنانی؛ زیوار؛ ژیـوار؛ نـسک: ۱. تایبەتمەندی بوونەوەری زیندوو کـە دەبێتـە هۆی جیاوازی لەگەڵ شتگەلی بـێ‌گیانـدا و بـە سـووت و سـاز، گەشـە و گـووران، زا و زێ و پەرچدانەوە خـۆی دەردەخـات ‹زنـدگی جـانوری: ژینی گیانەوەری› ۲. گوزەران؛ لایەنێ لە چالاکی یان ڕابـواردنی کەسـێ ‹زنـدگی خـصوصی: ژیـانی تایبەتی› ۳. جیو؛ نـسک؛ زیـوار؛ ژیـوار؛ بژیـوی؛ پێداویستی ژیان ‹با ماهی دویست هزار تومان زندگی او نمی‌گذشت: بە مانگێ دوو سەد هەزار تمەن ژیـانی

بەڕێوە نەدەچوو› ٤. *[گفتاری]* شتومەک؛ کەل‌وپەلی ناو ماڵ ٥. بەسەرهات؛ ژیاننامە ‹کتابی دربارەی زندگی پاستور خواندم: کتێبێکم لەمەڕ ژیانی پاستۆر خوێندەوە›.

▣ **زندگی سگی**: *[تعریض]* ژیانی سەگی؛ سەگ مەرگی؛ سەومەرگی؛ ژیواری پڕ لە ژاری.

▣ **زندگی دادن**: ژیاندن؛ ژیانن؛ بەخێوکردن؛ بژیو پێدان.

**زندگی را بدرود گفتن**: *[ادبی]* کۆچی دوایی‌کردن؛ کۆچی یەکجاری‌کردن؛ ماڵاوایی یەکجاری‌کردن؛ دنیای ڕوون بە جێ‌هێشتن؛ مردن؛ فەوتان ‹استاد هژار در سال ۱۳۶۹ زندگی را به درود گفت: مامۆستا هەژار لە ساڵی ۱۳٦۹دا کۆچی دوایی کرد›.

**زندگی کردن**: ژیان؛ ژیوەی؛ ژیوای؛ یاشتن؛ زینەدگی‌کردن: ١. هەبوونی چالاکیگەلی پێوەندیدار بە گیانلەبەرەوە (وەک سووت و ساز، گەشە و گووران، زا و زێ و...) ٢. ژین بە سەر بردن؛ دانە سەر؛ بە سەر بردن؛ ماوەیێ لە تەمەن لە شوێنێ یان لە بار و دۆخێکدا دانە سەر ‹سه سال در آن شهر زندگی کرد: سێ ساڵ لەو شارەدا ژیا›.

**از زندگی سیر/بیزار/خسته شدن**: لە ژیان وەڕەز بوون؛ ژیان لە بەر چاو کەوتن؛ ژینەتاڵ نەویستن؛ لە ژین یاس بوون؛ جە زینەگی بێزار بیەی؛ جە زینەگی مانیای؛ ئۆگری ژیان نەبوون.

**به زندگی خود خاتمه دادن**: قاڵی خۆ برینەوە؛ بە ژیانی خۆ دوایی هێنان؛ خۆ کوشتن؛ وێ‌کۆشتەیوە؛ خۆکوژی‌کردن ‹با خوردن دارو به زندگی خود خاتمه داد: بە خواردنی دەرمان قاڵی خوی بریەوە›.

**به زندگی کسی خاتمه دادن**: قاڵی کەسێک برینەوە؛ سپی‌کردن؛ سپی‌کردنەوە؛ بوونە باییسی کەسێ؛ کەسێک کوشتن ‹روسری را به دور گردنش پیچید و به زندگی او خاتمه داد: سەرپۆشەکەی پێچاندە دەوری ملیەوە و قاڵی بریەوە›.

**زندگی‌سوز** / zendegîsûz/: *صفت. [مجازی]* ژیان‌بێز؛ ژیان‌تاڵ‌کەر؛ ژیان‌تاریک‌کەر؛ ژیان‌ڕەشکەر؛ ژین‌کوێرکەر؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی بەدیهێنانی ڕەنج و دژواری و بە فیڕۆدانی ژیان.

**زندگینامه** / zendegînâme، ـها/: *اسم.* ژینامە؛ ژیننامە؛ ژیان‌نامە؛ گوزارشێک لەمەڕ بەسەرهاتی ژیانی کەس یان کەسانێکەوە.

**زنده** / zende، ـها؛ ـگان/: *صفت.* زیندوو؛ زندوو؛ زینوو؛ زینگ؛ زینە؛ زنوو؛ زننە؛ زیندی؛ زنەی؛ زێنە؛ زینک؛ زنە: ١. ژیاندار؛ زیندەوار؛ زیندەماڵ؛ زیندەوەر؛ ژیەی؛ بەهرەوەر لە ژیان ‹ماهی زنده: ماسی زیندوو› ٢. زیندەوار؛ زیندەماڵ؛ زیندەوەر؛ بە جموجووڵێ کە لە بوونی گیانەوەران دەوەشێتەوە ‹شهر زنده: شاری زینوو› ٣. بە گوڕ و گەشە ‹زنده دل: دڵ زینک› ٤. لێهاتوو لە نیشاندانی هەستی چالاکی، گوڕ و گەشەدا ‹صحنه‌ی زنده: دیمەنی زیندوو› ٥. ڕاستەوخۆ (لە بلاوکردنەوەی بەرنامەی ڕادیۆ و تەلەڤیزیوندا) هاوکات لەگەڵ بەڕێوە چوونیدا ٦. کاڵ؛ نەکوڵیو؛ نەکوڵاو (لەمەڕ برنج، نۆک و...).

▣ زنده شدن: ژیانەوە؛ زیندوو بوونەوە؛ زینەوە بیەی: ١. وشیار بوونەوە؛ وریا بوونەوە؛ بە دەست هێنانی دووبارەی ژیان ‹پس از سه ساعت که از مرگش می‌گذشت، دیدند زنده شده و دارد نفس می‌کشد: سێ سەعات دوای مردنی، بینیان کە زیندوو بوەوە و خەریکە هەناسە دەدا› ٢. ژووژانەوە؛ ژووژیانەوە؛ بووژانەوە؛ ئەوەژیوەی؛ ژیوایوە؛ کەوتنە خۆ؛ بە دەست هێنانی دووبارەی سەلامەت، پاراوی یان چالاکی خۆ ‹دشت از بارانهای بهاری زنده شد:

دەشــت بــە بــارانی بــەهاری ژووژایــەوە›
٣. ژووژانـــەوە؛ بووژانـــەوە؛ بزووتنـــەوە؛ ئەوەژیوەی؛ ژیوایوە؛ بە دەست هێنانی برەو و باوی لەمە پێش ‹اقتصاد کشور زنده شد: ئـابووری ولات ژووژایەوە›. هـەروەها: **زنده بـودن؛ زنـده کردن**

**زندەباد** / zendebād/: *دعا.* بژی؛ نەمری؛ وشەیێ بـۆ دەربـڕینی داخـوازی خـۆڕاگری و مانـەوەی کەسێ یان شتێک ‹زندەباد صلح: بژی ئاشتی›.

**زنـدەبگـور** / zendebegûr/: *صـفت.* زینـەچاڵ؛ زینده بە گۆڕ؛ زینە بە گۆڕ؛ زینە چاڵ؛ کـار یـان ڕەوتی داپۆشران لە ژێری شتێکەوە (وەک خاک، بەرد، بەفر) بەر لە مەرگ کە بێتـە هـۆی مـردن ‹ده نفر در زیر آوار زنده به گور شدند: دە کەس لە ژێـر دار و پەردوودا زینەچاڵ بوون›.

**زندەدل** / zendedel ، ـان/: *صفت.* ١. دڵزیندوو؛ دڵـگەش؛ دڵاوا؛ دڵاوەدان؛ بـەگوڕ؛ دڵزینـدی؛ دڵبژی ٢. *[کنایی]* ئەویندار.

**زندەزا**[1] / zendezā/: *اسم.* زگـوزا؛ زگـوزێ؛ زا و زێ؛ سـک و زا؛ زا و زوو؛ زەو؛ کـار یـان ڕەوتی زان؛ زای؛ بێچوو دیتن.

**زندەزا**[2]: *صفت.* *[زیستشناسی]* بەچ‌زێ؛ بێچووزێ؛ ژیـوزێ؛ لێهـاتوو لـە زانی بێچـووی زینـدووی گووراودا (وەک مرۆڤ). بەرانبەر: **تخمزا**

**زندەیاد** / zendeyād ، ـان/: *صفت.* نەمر؛ خاوەنی ژیان و کاری شایانی وا کە دوای مردنیش لە بیر و دڵدا ماوەتـەوە ‹زنـدەیـاد گـوران در شعر نـوآوری داشت: نەمر گۆران لە شیعردا داهێنانی هەبوو›.

**زندیق** / zendîq, zandîq ، ـان/: [معرب از پهلـوی] *صفت.[قدیمی]* زنـدیق؛ مانــوی؛ شـوێنکەوتووی یەکێ لە ئایینگـەلی ئێـرانی، بەتایبـەت ئـایینی مانی.

**زنذلیل** / zanzalîl ، ـها/: [فارسـی/ عربـی] *صفت.* ژنئاغە؛ ژناخە؛ دەستگۆ؛ ژێردەست و گـوێ لـە مستی ژن (هاوسەر) ‹همسایەی مـا خیلـی زنذلیـل است: دراوسێکەمان یەکجار ژنئاغەیە›.

**زنسـالاری** / zansālārî/: *اسم. [جامعـەشناسـی]* ژنسالاری؛ ژنمەزنی؛ نیزامێکی کۆمەڵایەتی کە تێیدا دەسەڵات بە دەستی ژنانەوەیە.

**زنستیزی** / zansetîzî/: *اسم.* دژایـەتی لەگـەڵ ژناندا و بێباوەڕی بە لێهاتوویی و توانایی ژنان.

**زنعمو** / zan'amû ، ـها/: [فارسی/ عربی/ فارسـی] *اسم.* مـامۆژن؛ مـەمۆژن؛ ئـامۆژن؛ مـامژەنی؛ مامۆژەنی؛ ژنئاپ؛ نیاژێ؛ ژنی مام.

**زنک** / zanak/: *اسم. [تعریض]* ژنـەتیو؛ کچـەتیو؛ ژنی ئاماژە پێکراو ‹زنک میخواست بچەی مرا بـدزد: ژنەتیو دەیویست منداڵەکەم برفێنێ›.

**زنکـن** / zonkan ، ـهـا/: [آلمـانی]/*اسم.* زونکـەن؛ پەروەندان؛ ناوی بازرگـانی کەرەسـتەیێک وەک بــەرگێکی گــەورە و ئەســتوور کــە بەڵــگە و نووسـراوەی تێـدەنێن و بـۆ بـەرگری لـە بـڵاوە بوونیــان، لێوارەکانیــان کــون دەکــەن و بــە میلەیانـەوە دەکـەن و بـە فەنـەر دەیانبەسـتن: **زونگن**

**زنگ** / zang/: *اسم.* زەنگ؛ زەنگە: ١. *ـها/* زیـل؛ زەنگل؛ زەنگۆڵە؛ ئامێرێ بۆ سەرنج ڕاکێشان یان وشیاری دان بە شـێوەی: *الـف)* کەرەسـتەیەکی کانزایی ناو هۆڵ کە گۆیـەکی لـە ناودایـە و لـە هەژاندنــدا دەنگێکــی زایەڵــەداری لــێدێـت *ب)* پەڕەیەکی کانزایی هەڵواسراو کـە بـە هـۆی کوتانی بە چەکوچەوە دەنگێکی زایەڵەداری لێوە دەردێ *ج)* دەزگایێ ئیلکترۆمیغناتیسی، بـریتی لە پەڕەیەکی کانزایی و میغناتیسێکی نزیک بـە یـەک کـە بـە لێـدانی دوگمەیـەک، کارەبـا لـە ناوەنـدی میغناتیـسیەکەدا وەگـەڕ دەکـەوێ و ڕادانی لە پەستای پەڕەی کانزایی دەبێتە هـۆی بــەرز بوونــەوەی دەنگێکــی وشــیارکەرەوەی زایەڵەدار *د)* دەزگـایێکی ئیلکترونیکـی کـە بـە لێدانی دوگمەیێ کارەبای تێدا وەگەڕ دەکـەوێ و دەبێتـە هـۆی بـڵاو بوونـەوەی دەنـگ یـان

ئاهەنگێکی تایبەت ‹زنگ بلبلی: زەنگی بولبولی› ۲. /ـها//قدیمی/ سازێکی زەرپی وەک سنج ۳. /ـها/ کاتی چالاکی تایبەت لە قوتابخانە ‹زنگ تاریخ: زەنگی مێژوو› ٤. دەنگی زەنگێ کە سەرەتا یان کۆتایی ئەم چالاکیە ڕادەگەیێنێ ‹پاشو! مگر زنگ را نمی‌شنوی؟: هەستە! مەگەر زەنگەکە نابیسی؟› ٥. /ـها/ ماوەی چالاکیەکی وانەیی دیاریکراو (دەور و بەری ٤٥ تا ٥٥ دەقیقە) لە قوتابخانەدا ٦. چینگ؛ زونگە؛ زایەلە؛ کار یان ڕەوتی زرینگانەوە (وەک دەنگی وێککەوتنی دوو کانزا) ‹گوشم زنگ می‌زند: گوێم دەزرینگێتەوە› ۷. ژەنگ؛ ژەنگی؛ ژەنگار؛ کوورمووری؛ ماکێکی سوورتۆخی ناسک کە لە سەر کانزا، بەتایبەتی ئاسن، بە هۆی هەوای شێدارەوە بەدی دێت ‹قابلمه زنگ زده است: قاولمەکە ژەنگی هێناوە› ۸. ژەنگ؛ ژەنگی؛ ژەنگار؛ هەر کام لە نەخۆشیگەلی جۆراوجۆری گیایی کە بە هۆی چالاکی جۆرێ کارگەوە سەر هەڵدەدا و دەبێتە هۆی پواوی و ژەنگ لێدانی ڕیشوو، لاسک و گەڵای گیا ‹بیشتر گندمها زنگ زده‌اند: زۆربەی گەنمەکان ژەنگیان هێناوە›: **زنگ گیاهی**

▣ **زنگ اخبار:** زیل؛ زڕنە؛ زەنگ؛ زەنگێک کە بۆ وەئاگا هێنانی کەسێک بە کار دەبرێ.

**زنگ بلبلی:** زەنگی بولبولی؛ جۆرێ زەنگی ئیلکترۆنیکی کە دەنگی چریکەی لێوە دێ.

**زنگ تفریح:** زەنگی وچان؛ کاتی حەسانەوە؛ کاتی پشوودان؛ ماوەی کورتی دوای کەرتێکی وانە کە قوتابیان دەتوانن لە پۆل بچنە دەرەوە و پشوویەک بدەن.

**زنگ چاودار:** جۆرێ کارگی گیایی چاودار.

**زنگ خطر:** زەنگی مەترسی؛ زەنگی خەتەر.

**زنگ کاروان:** بۆڵ؛ زەنگی ملی پێشەنگ.

**زنگ کلیسا:** جمخار؛ زڕنەی کڵێسە؛ زەنگی کلیسا؛ ناقووس.

**زنگ گیاهی** ☜ **زنگ ـ ۸**

**زنگ مس** ☜ **زنگار ـ ۲**

▣ **زنگ خوردن:** زەنگ لێدران؛ زەنگ دریەی؛ زەنگلین؛ زەنگ دران؛ بەرز بوونەوەی دەنگی زەنگ ‹وقتی به مدرسه رسیدیم زنگ خورده بود: کاتێ گەیشتینە قوتابخانە زەنگ لیدرابوو›.

**زنگ زدن:** ۱. زەنگ لێدان؛ زەنگدان؛ زەنگ داین؛ لە زەنگ دان؛ زەنگ دەی/ دای؛ زرنگانەوە؛ دەنگ لە زەنگەوە دەرهێنان ‹زنگ زدند، ببین کیست: زەنگیان لیدا، بزا کێیە› ۲. زەنگدان؛ زەنگ لێدان؛ زەنگ دەی/ دای؛ تەلەفوون کردن ‹به آزاد زنگ بزن، حالش را بپرس: زەنگێک لیدە بۆ ئازاد، بزانە چۆنە› ۳. ژەنگ هێنان؛ ژەنگ لێدان؛ ژەنگ لێ‌نیشتن؛ گەزن دیتنی گژ و گیا و دەغڵ و دان بە هۆی ژەنگەوە ‹ساقه‌ی زنگ زده: ساقەتەی ژەنگ هیناو› ٤. ژەنگ هێنان؛ ژەنگ هاوردن؛ ژەنگ ئاردەی؛ ژەنگ لێ‌نیشتن؛ ئوکسیدە بوونی کانزا؛ پەیدا بوونی ماکی ژەنگ بە رووی کانزاوە ‹ساعتم زنگ زده بود: سەعاتەکەم ژەنگی هینابوو›.

**زنگاب** / zangāb/: /اسم/. ژەنگاو؛ زەرداو؛ پەڵە یا شوێنی نم (زۆرتر بە سەر میچ و دیوارەوە).

**زنگار** / zangār/: /اسم/. ژەنگار: ۱. /ادبی/ ژەنگ؛ چڵکی سەر کانزا ۲. ژەنگی مس؛ زەنجار؛ ژەنگی مس کە ماکێکی کەسکی شینباوە و زۆر ژاراوییە و زۆرتر لە پەنای ئەسید یان بە هۆی پواویەوە پەیدا دەبێ: **زنگ مس**

**زنگاری**[1] / zangārî/: /اسم/. ژەنگاری؛ ژەنگاڵی؛ پیرۆزەیی؛ ڕەنگی سەوزی ئاماڵ شین؛ ڕەنگی کەسکی مەیلەو کەوە.

**زنگاری**[2]: /صفت/. ژەنگاری؛ ژەنگاڵی؛ بە ڕەنگی سەوزی ئاماڵ شین.

**زنگدار** / zangdār/: /صفت/. زەنگدار؛ زەنگین: ۱. زەنگی؛ زەنگار؛ بە زەنگ ‹ساعت زنگدار: سەعاتی زەنگی› ۲. زایەڵەدار؛ بە زرنگە؛ زرنگەدار

‹صدای زنگدار: دەنگی زرنگس›.

**زنگ‌زدگی** / zangzadegî/:اسم. ژەنگاژۆیی؛ ژەنگارۆیی؛ ژەنگ‌هێناوی؛ ژەنگ لێداوی؛ ژەنگ لێ‌نیشتوویی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ژەنگ هەڵهێنانی کانزا.

**زنگوله** / zangûle ، ـها/:اسم. زەنگۆڵە؛ زەنگوڵە؛ زەنگول؛ زەنگوولە؛ زەنگڵ؛ زەنگڵە؛ چەنگ؛ زەنگی گچکە کە پتر دەیکەنە ملی چوارپێیان.

▣ زنگوله‌ی پای تابوت:[مجازی] هەڵواخۆری دەور تاوت؛ منداڵی وردی کەسێکی بەساڵاچوو.

**زنگی** / zangî ، ـها؛ ـان/: صفت.[ادبی] ڕەش‌پێست؛ قولەڕەشە؛ ڕەش‌پێس؛ ڕەش‌پۆس.

**زننده** / zanande/: صفت. ناحەز؛ لێدەر؛ جارزکەر؛ ناشیرین و هۆی بێزاری ‹بوی زننده: بۆنی ناحەز›.

**زن‌نما** / zan.nemā/: صفت. ژنانی؛ ژنانیلە؛ ژنەڕەنگە؛ سەرژنانە؛ سەرژنانیلە؛ بلەکناچێ؛ پۆپن؛ کناچلەڕەنگ؛ قالەژنە؛ خاوەن ڕواڵەتی ژنانە ‹مرد زن‌نما: پیاوی ژنانی›.

**زن‌وبچه‌دار** / zan-o-baččedār/: صفت.[گفتاری] خێزانبار؛ خێزاندار؛ منالدار؛ ژن و منداڵبار؛ خاوەن هاوسەر (ژن) و منداڵ ‹ما مستأجر زن‌وبچه‌دار نمی‌خواهیم: ئێمە کرێ‌نشینی خێزانبارمان ناوێ›.

**زنون** / zenon/: [از انگلیسی] ☜ **گِزِنُون**

**زنهار**[1] / zenhār ، ـها/:اسم.[نامتداول] دەخیلە؛ دەغیلە؛ دەخیل؛ ئامان؛ ئەمان؛ نامە؛ ناما؛ نامەردان؛ دوچ: **زینهار**

▣ زنهار خواستن: ئامان خواستن؛ ئەمان خواستن؛ ئەمان ویستن؛ مۆڵەت ویستن؛ هانا بردن.

زنهار دادن: ئەمان دان؛ ئامان دان؛ هانا دان؛ پەنا پێدان.

به زنهار آمدن: داماو بوون؛ بێ دەرەتان داکەوتن؛ دەستەوسان بوون؛ دەست و دامان مان؛ کۆست کەوتن؛ کەوتنە حەلوەلا.

**زنهار**[2]: صوت.[ادبی] ئامان؛ نامە؛ ئەمان؛ دەخیلە؛ دوچ؛ نهێ؛ نەکەی؛ وشەی مەترسی‌دان ‹زنهار زبان ز بد نگهدار: ئامانە زمان لە چەوت بپارێزە›: **زینهار**

**زنهاره** / zenhāre/:اسم. دواهای؛ ئولتیماتوم؛ دوایین بە گوێدا دانی هاوڕێ لەگەڵ هەڕەشە و دیاری‌کردنی مۆڵەت بۆ وەرام.

**زنی**[1] / zanî/:اسم. ژنی؛ ژنەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ژن بوون.

**-زنی**[2]: پیواژه. ـ لێدەری؛ ـ وەشێنی؛ ـ شانی؛ ـ شەنی؛ ـ ژەنی؛ ـ ژێنی؛ کار یان ڕەوتی لێدان ‹پاروزنی؛ دف‌زنی: پارۆشەنی؛ دەف‌ژەنی›.

**زوائد** / zavā'ed/: [عربی] ☜ **زواید**

**زوار** / zavvār/: [عربی] صفت. زیارەتچی؛ زیارەتکەر.

**زوار** / zovvār/: [عربی] جمعِ ☜ **زایر**

**زوال** / zavāl/: [عربی]اسم.[ادبی] فەوتاوی؛ گڕ و فڕی؛ تیاچوویی؛ نابوودی؛ ڕەوتی تێدا چوون؛ نەمان؛ نەمەنەی؛ ئاوا بوون؛ لە نێو چوون.

▣ زوال عقل: نەمانی ژیری؛ نشێوی هزر؛ ڕەوتی کەم بوونەوەی هێزی هزر (بیرەوەری، کۆکردنەوەی زەینی، تێفکرین) بە هۆی گەزن ڕوودان لە مێشکدا (ژاراوی درێژخایەن، نەخۆشی یان پیری).

▣ زوال یافتن: لە نێو چوون؛ فەوتان؛ فەوتیان؛ نەمان؛ نەمەنەی؛ تێدا چوون.

**زواله** / zavāle/:اسم. پرپۆڵە؛ دانی جووچکی تازە لە هێلکە دەرهاتوو.

**زوایا** / zavāyā/: [عربی] جمعِ ☜ **زاویه**

**زواید** / zavāyed/: [عربی]اسم. ۱. جمعِ ☜ **زایده** ۲. بێ‌کەڵک؛ زیایی؛ ناپێویست؛ ئەوی زۆر پێویست نەبێ ✻ **زوائد**

**زوبین** / zûbîn ، ـها/: اسم. خشت؛ دلام؛ زەرگ؛ ڕمب؛ زووبین؛ کورتەنێزە؛ ئامێری شەڕی کەونارا بە شێوەی ڕمی پچووکی نووک تیژ بە سەری دووشاخەوە.

**زوج**[1] / zowc, zo:c ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. شوو؛ مێرد ‹زوج و زوجه باید حاضر باشند: ژن و شوو دەبێ بن› ٢. جووت؛ جفت؛ جیت؛ ژن و شوو؛ ژەن و شوو؛ ژن و مێرد ‹زوجهای جوان: ژن و شووگەلی لاو›.

**زوج**[2]: صفت. جووت؛ جفت؛ جۆت؛ جیت: ١. شیاوی دابەش بوون بە دوو لەتەوە ٢. دوانە؛ دوو تایی و دوو تاقی.

**زوجات** / zowcāt, zo:cāt/: [عربی] جمعِ ☜ **زوجه**

**زوجه** / zowce, zo:ce ، ـها؛ زوجات/: [عربی]/اسم. [ادبی] ژن؛ ژەنی؛ پیرەک؛ هاوسەری پیاو.

**زوجیت** / zowcîyyat, zo:c-/: [عربی]/اسم. هاوسەری؛ هاوسەریەتی ‹او را به زوجیت خود درآورد: کردی بە هاوسەری خۆی›.

**زوجین** / zowceyn, zo:c-/: [عربی]/اسم. ژن و شوو؛ ژەن و شوو؛ جووت ‹طلاق با توافق زوجین صورت می‌پذیرد: تەلاق بە ڕەزامەندی ژن و شوو سەر دەگرێ›.

**زود**[1] / zûd/: صفت. زوو؛ زی: ١. بەر لە کاتی دیاریکراو یان شیاو ‹حالا زود است: ئێستا زووە› ٢. لە سەرەتای کاتدا ‹صبح زود: بەیانی زوو›.

**زود**[2]: قید. زوو؛ زی؛ بەلەز؛ خێرا؛ گورج؛ کرژ؛ ئازا؛ ئازانە: ١. بێوەستان؛ بێمەودای کاتی ‹زود بیا: زوو وەرە› ٢. بەر لە کاتی تەرخانکراو ‹زود رسیدم: زوو گەیشتم› ٣. بە پەلە؛ بە توندی؛ بە هەشتاو ‹زود جواب داد: زوو وەرامی داوە›.

**زود ـ**[3]: پیشواژه. زووـ: ١. بەر لە کاتی ئاسایی ‹زودرس: زووڕەس› ٢. بە توندی و خێرایی ‹زودباور: زووباوەڕ›.

**زودافت** / zûd'oft/: صفت. [گیاەشناسی] بە ئەندامێکی وا (بەتایبەت گەڵا) کە بەر لە کاتی خۆی بە شێوەی ئاسایی جوێ بێتەوە و داکەوێ.

**زودباور** / zûdbāvar ، ـها؛ ـان/: صفت. زووبڕواکەر؛ زووباوەڕ؛ ساکار؛ ساویلکە؛ خاوەنی خوو یان ئۆگرەتی خێرا بڕوا کردن بە قسەی خەڵک، بێلێکۆڵینەوە.

**زودپز**[1] / zûdpaz/: اسم. دیگ زودپز ☜ **دیگ**

**زودپز**[2]: صفت. خۆش‌کوڵ؛ زووکوڵ؛ بە کڵۆک؛ بەتایبەتمەندی خێرا و خۆش کوڵانەوە.

**زودجوش** / zûdcûš/: صفت. ١. [مجازی] خوەش‌جۆش؛ گەرم؛ خاوەن خوو یان مەیل بە دامەزراندنی پێوەندی لەگەڵ دیتران لە کاتێکی کەمدا ‹دختر زودجوش و مهربانی است: کچێکی خوەش‌جوش و دلۆڤانە› ٢. زووکوڵ؛ زووکوڵێن؛ بەتایبەتمەندی یان توانایی زوو هێنانە کوڵەوە ‹این سماور خیلی زودجوش است: ئەم سەماوەرە زۆر زووکوڵە› ٣. زووکوڵ؛ زووکڵۆک؛ بەتایبەتمەندی زوو هاتنە کوڵەوە ‹مایع زودجوش: تراوی زووکوڵ›.

**زودخشم** / zûdxašm/: صفت. [ادبی] ئاڵەتی؛ زووگرژ؛ زووگژ؛ زووهەڵچۆ؛ خاوەن تایبەتمەندی زوو هەڵچوونەوە و بێ دەسەلات لە خواردنەوەی تووڕەیی و ئاڵۆزی خۆ. هەروەها: **زودخشمی**

**زودرس** / zûdras ، ـها/: صفت. زووڕەس؛ زووڕەسە؛ ڕەبت؛ ڕەبیت؛ جەدماد؛ ئەنروک: ١. نادە؛ بە تایبەتمەندی زوو پێگەیین ‹میوەی زودرس: بەری زووڕەس› ٢. پێگەیشتوو لە زەین و لەشدا پێش ماوەی خۆی.

**زودرنج** / zûdranc ، ـها/: صفت. زیز؛ زووتۆر؛ بهن‌تەنگ؛ تۆرینۆک؛ فیشقی؛ دڵناسک؛ گونروو؛ بێسەبر و تابشتی پێویست لە بەرامبەر ئاکار و

کردەوەی ناحەزی دیترانەوە. هەروەها: **زودرنجی**

**زودگذر** / zûdgozar/: *صفت.* کەم تەمەن؛ خێراتێپەڕ؛ زۆر پێنەچوو؛ لەز تێپەڕ.

**زودگوار** / zûdgovār/: *صفت.* سووک؛ سۆک؛ زووهەرس؛ زووتاو؛ بە تایبەتمەندی زوو هەرسەک بوونەوە.

**زودگیر** / zûdgîr/: *صفت.* ۱. خۆش گر؛ زووگر؛ بە تایبەتمەندی زوو هەڵگرسانەوە ۲. زووگرس؛ زووگر؛ بە تایبەتمەندی خێرا سفت بوونەوە و بە شێوەی دڵخواز دەرهاتنەوە ‹سیمان زودگیر؛ چسب زودگیر: سیمانی زووگر؛ چەسبی زووگر›.

**زودمیر** / zûdmîr، ـان/: *صفت.* *[نامتداول]* ژین‌کورت؛ خاوەن ژیانێکی کورت.

**زودهضم** / zûdhazm/: [فارسی/ عربی] *صفت.* سووک؛ سۆک؛ زوودەن؛ زووهەرس؛ زووتاو؛ بە تایبەتمەندی زوو هەڵتاویانەوە.

**زودی** / zûdî/: *اسم.* زوویی؛ دۆخ و چۆنیەتی زوو بوون ‹به این زودی تمام شد: بەم زوویە تەواو بوو›.

▣ به این زودی: ئابەم زوو؛ بەم زوویییە؛ بەم زوویانە؛ ئیپی زوە؛ پیزوەنە؛ پیزوونە؛ لە ئاوا ماوەیەکی کەمدا.

**زودیاب** / zûdyāb/: *صفت.* *[ادبی]* بەردەست؛ بە تایبەتمەندی دۆزیانەوە، لە ماوەییکی کەمدا.

**زور** / zûr/: *اسم.* زۆر: ۱. هێز؛ هازی؛ وزە؛ ستووری؛ ستین؛ زەبر؛ دەگەرە؛ گوژم؛ قەوەت ۲. گوشار؛ تەوژم؛ نهێم ۳. کەلەمەک؛ ستەم؛ گووج؛ جەور؛ کار یان کردەوەیێ کە نە بە گوێرەی ژیری یان عەدالەت، بەڵکوو بە پێی زۆر و گوشارەوە بێ.

▣ از زور: لە تاو؛ لە بەر ‹از زور گرسنگی برگ درخت می‌خوردند: لە ... برسیەتیدا گەڵای داریان دەخوارد›.

با زور: بە زۆر: ۱. بە پێداگریەوە ۲. بە زەرپی هێز.

▣ زور آوردن: *[گفتاری]* زۆر هێنان؛ زۆر هاوردن؛ زۆر ئاردەی؛ زۆر بۆ هێنان؛ گوشار خستنە سەر شتێ ‹آب زور آورد، پل را شکست: ئاو زۆری هینا، پردەکەی برد›. هەروەها: **زور آمدن**

**زور دادن**: *[گفتاری]* زۆرلێ‌کردن؛ هێزدان؛ زۆر وەنەکەردەی؛ هوژم بردنە سەر شتێک ‹زور بده! بلکه باز شود: زۆر کە! بەشکوو بکرێتەوە›.

**زور داشتن**: ۱. زۆردار بوون؛ بە هێز بوون ‹آزاد زور زیادی داشت: ئازاد زۆریکی فرەی هەبوو› ۲. زۆر لێهاتن؛ پێ زۆر بوون؛ دژوار بوون؛ سەخت بوون؛ پێ‌سەخت بوون ‹برایم زور داشت بروم منت این و آن را بکشم: پێم زۆر بوو بچم منەتی ئەم و ئەو بکێشم›.

**زور زدن**: ۱. زۆرکردن؛ زۆردان؛ هێزدان؛ زۆرکەردەی ‹هر چه زور زدم باز نشد: هەر چەن زورم کرد نەکرایەوە› ۲. *[مجازی]* زۆر لێکردن؛ زۆر بۆ هێنان؛ زۆر ئاردە پەی؛ هەوڵ دان؛ تەقالادان؛ تێکۆشان ‹چقدر زور زدم تا قول داد پولی بە تو قرض بدهد: چەندەم زۆر لیکرد تا بڕیاری دا قەرزت پێبدا›.

**زور کردن**: *[گفتاری]* زۆرکردن؛ مڕانن؛ زۆرکەردەی؛ پێداگری کردن ‹خیلی زور کرد تا مرا هم ببرد: گەلێک زۆری کرد تا منیش ببات›.

**زور کسی آمدن**: زۆر لێهاتنی کەسێ؛ پێی سەخت بوون؛ بە مەیلی کەسێ نەبوون ‹زورش می‌امد جواب سلامم را بدهد: زۆری لێ‌دەهات وەرامی سەلامم بداتەوە›.

**زور کسی نرسیدن**: زۆری کەسێک پێنەشکان؛ زۆری کەسێک نەگەیشتن؛ دەرقەت نەهاتن؛ دەرقەوە نەیاشتن؛ نەتوانین ‹زورش نمی‌رسید کیسه را بلند کند: زۆری پێ‌نەدەشکا کیسەکە هەڵگرێ›.

**زور گفتن**: *[مجازی]* زۆرەملی کردن؛ بە زۆر پێ کردن؛ کەرەگایی کردن؛ کەلەگایی کردن؛ کەڵک گرتن لە زەبر و زۆر بۆ گوێ‌لەمست

کردنی خەڵک.

**زورآزمـــایی** / zûrāz(e)māyî ، ـهـا/: اسـم. زۆرەزمـــە؛ زۆرەزمـــێ؛ زۆرانبـــازی؛ زۆرانی؛ زۆرەوانی؛ زۆرەبانـێ؛ عـەفرە؛ مـڕمار؛ کـار یـان ڕەوتی تـاقی‌کردنـەوەی زۆر و گـوڕی خـۆ: **زورورزی.** هـەروەها: **زورآزمـایی کـردن؛ بـه زورآزمایی پرداختن**

**زورآور** / zûrāvar/: صفت. ١. زۆردار؛ بەهێز؛ بـه قەوت ٢. بە تەوژم؛ بە گوشار.

▣ **زورآور شدن:** زۆر بۆ هێنان؛ زۆر پەی‌ئاردەی؛ تەوژم هێنان ‹گرسنگی به او زوراور شد: برسیەتی زۆری بو هینا›.

**زورافزایـــی** / zûrafzāyî/: اسـم. هێزنکـــی؛ وزەدەری؛ دوپینـگ؛ کـار یـان ڕەوتی کەڵـک وەرگرتن لە دەوای هێزدەر.

**زورتپان** / zûrtapān/ ☜ **زورچپان**

**زورچپـــان** / zûrčapān/: صـفت. پاڵەپەســت؛ پاڵەپەستۆ؛ زۆرتـەپێن؛ زۆرتـەپان؛ تـێ‌پەسـتاو؛ زۆرئاخن؛ زۆرەخن؛ بە زۆر ئاخنراو لە شوێنێکدا: **زورتپان**

▣ **زورچپان کردن:** پاڵەپەستۆکردن؛ زۆرەخـن کـردن؛ زۆرتـەپێن‌کـردن؛ بـە زۆر ئـاخنین؛ تەپاندن؛ بە زۆر پەستاندن؛ بە زۆر پەسـتاوتن؛ ترنجاندن؛ تێ‌ترنجاندن؛ تێ‌ڕاکـردن ‹کتابها را این‌طور توی قفس زورچپان می‌کنی، جلدشان خـراب می‌شود: ئاوەها کتێبەکان دەتاخنیە ناو قەفەسەوە، بەرگەکانیان خراپ دەبێ›.

**زورخانه** / zûrxāne ، ـها/: اسم. زۆرخانە؛ باشگای وەرزشی کۆنی ئێرانی بریتی لە دالانێکـی سـەر داپۆشراو و گۆڕەپـانێکی جەغزۆکـە و چـاڵ کـە وەرزشگەلی کەونارای تێدا دەکرێ.

**زورق** / zowraq, zo:raq ، ـهـا/: [عربـی]اسـم. [ادبی] بەلەم؛ لۆتکە.

**زورکـی**[1] / zûrakî/: صـفت. [گفتـاری] زۆرەکـی؛ زۆری؛ زۆراتی؛ بـە زۆر؛ بـە خـورتی؛ خـورتی؛ ناعیلاج؛ زۆردەستی؛ کەرەزەڕی ‹خندەی زورکـی: پێکەنینی زورەکی›.

**زورکی**[2]: قید. [گفتاری] به زۆر؛ بـه زۆری؛ زۆری؛ زۆراتی؛ زۆرەکی؛ زۆرەملێ؛ بە خورتی؛ جـەبری؛ نەوەدڵی؛ بە زەبری هێز ‹نمی‌گرفت، زورکی دادم: نەیدەگرت، بە زور پێمدا›.

**زورگو** / zûrgû ، ـها؛ ـیان/: صفت. زۆربێژ؛ ملـهوڕ؛ مـل‌هـڕ؛ خـاوەن خـوو یـان مـەیل بـە کەڵـک وەرگرتن لە زۆر و گوشار بۆ ترساندنی خەڵـک و هەڵـنانیان بـۆ جێبـەجێ‌کـردنی کارێـک ‹صاحبخانەی ما خیلی زورگو است: خـاوەن‌ماڵـەکەمان یەکجار زوربێژە›.

**زورگـــویی** / zûrgûyî ، ـهـا/: اسـم. زۆربێـژی؛ زۆرەملـــی؛ زۆرملـــێ؛ زۆرداری؛ کـــەرەگایی؛ کەڵەگایی؛ کەڵک‌وەرگری لـە زۆر و گوشـار بـۆ هەڵـنانی خەڵـک بـە کـردنی کـارێ یـا بـۆ گوێ‌ڕایەڵ کردنیان.

**زورگیر** / zûrgîr ، ـها/: اسم. [گفتاری] بـاج‌سـێن؛ خاوەسـێن؛ کەسـێ کـە بـە زۆرداری خەڵـک تەڵەکە دەکا.

**زورگیـــری** / zûrgîrî ، ـهـا/: اسـم. [گفتـاری] بـاج‌سـێنی؛ خاوەسـێنی؛ کـار یـان ڕەوتی داگیرکردن بە زۆری زۆرداری.

**زورمداری** / zûrmadārî ، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. [سیاست] زۆرداری؛ تەپەسەری؛ شـێوەی بـە کـار هێنـانی زۆر و تـەوژم بـۆ ترسـاندن یـان مل‌کەچ‌کردنی خەڵـک و گـوێ‌ڕایـەڵ‌کردنیـان. هەروەها: **زورمدار**

**زورمنـد** / zûrmand ، ـان/: صفت. دەسـەڵاتدار: ١. دەگەنـەک؛ دەگـەنگ؛ زۆردار؛ لـە هێـرت؛ خورت؛ پڕ زۆر؛ بەهێز؛ پاڵەوان؛ خاوەنی هێز یان لێهاتوویی ٢. [مجازی] خاوەنی هێز و دەسەڵاتی سیاسی و کۆمەڵایەتی.

**زورمنـــدی** / zûrmandî/: اسـم. دەگـــەنگی؛ پاڵـەوانی؛ زۆرداری؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی زۆردار

بوون.

**زورنا** / zurnā/ ☜ **سُرنا**

**زوروَرزی** / zûrvarzî/ ☜ **زورآزمایی**

**زوری** ¹ / zûrî/: *صفت. [گفتاری]* زۆرەکی؛ زۆری؛ زۆرەملێ؛ خورتی؛ نەوەدڵی؛ داسەپێنی ‹چیزی را که زوری باشد دوست ندارم: شتی زۆرەملێ بێ پێم خۆش نیە›.

**زوری** ²: *قید. [گفتاری]* بە زۆری؛ زۆرەکی؛ زۆری؛ نەوەدڵانە؛ زۆربگیری؛ زۆرەملێ؛ بە زۆر؛ بە گوشارەوە ‹آقا مگر مهمانی رفتن زوری است: کاکە مەگەر میوانی چوون بە زۆرە›.

**زوزه** / zûze ، ـها/: *اسم.* لوورە؛ لوور؛ لەولەو؛ لوورەلوور؛ لوولە؛ کاز-کاز؛ کووز-کووز؛ نەکوچ: ١. زوورە؛ سەگلوور؛ لیرە؛ قروسکە؛ کرووزەی گیانەوەرانی تیرەی سەگاسایان کە وەک ناڵەی بەرز وایە ٢. ناڵە و شین بە دەنگی بەرز و زیق.

⊡ زوزه کشیدن: لوورانـدن؛ لـویرانن؛ لوورنـەی؛ لوورنای؛ لوولاندن؛ لوولانن؛ لیراندن؛ لیرین؛ لـویرین؛ لـوورین؛ لوورانـەوە؛ لیلەکەشـیەی؛ ئەوەلووریـەی؛ لوریـایوە؛ کاسـتین؛ کـووزین؛ زوورین؛ قروسکاندن؛ نەکوچانـدن: ١. دەنگ هەڵبرینی گیانەوەرانی وەک گورگ، سەگ و چەقەڵ ٢. ئاوەها دەنگێک لە خۆوە دەرهێنان.

**زوفا** / zûfā ، ـها/: [عربی] *اسم.* گیازلفە؛ پیرەزلفە؛ گیازلفان؛ گیایەکی پایا و بۆنخۆش بە لاسکی چێوی، گەڵای گچکەی بۆنخۆش، گوڵی جوانی سپیلکەی شین یان ئاڵی هێشوویەوە، کە بۆ دەوای بە کار دێنن.

**زولبیا** / zûlbiyā, zûlûbiyā ، ـها/: *اسم.* زلووبیا؛ شیرینیەکی تورتە لە ماستی ئاوچن و نشاستە کە لە ناو ڕۆندا سووری دەکەنەوە و لە شیرەی شەکری دەگەوزێنن بۆ ئەوەی شیرین بێ، مانای لە ڕەگەزدا واتا شیاوی پاروو لێ گرتن.

**زولو** / zûlû/: *اسم.* زوولوو: ١. هۆزی ڕەش‌پێستی ئەفریقای باشووری ٢. هەر کام لە بانتۆزمانانی وڵاتی ناتاڵ لە ئافریقای باشووریدا ٣. لە زمانگەلی بانتۆ کە لە ناو ئەو هۆزەدا قسەی پێ‌دەکرێ.

**زوم** / zûm/: [انگلیسی] *اسم.* زووم؛ جۆری نیسکۆی دووربینی وێنەگری و فیلمهەڵگری بە مەودای ناوەندی بگۆڕەوە.

⊡ زوم کردن: زوومکردن؛ کاری گۆڕینی مەودای ناوەندی نیسکۆی دووربین؛ بۆ بەرامبەرکردنی لەگەڵ بابەتی ویستراوی وێنەگر یان فیلمگر و دەرخستنی لە ناو چوارچێوەدا.

**زونا** / zonā/: [فرانسوی] *اسم.* زۆنا؛ نەخۆشیەکی سەختی ویرووسی کە بە شێوەی زیپکە و بلۆق لە درێژەی دەمارێکی پێستدا خۆ دەنوێنێ و ئێش و خارشتی زۆری هەیە.

**زونکن** / zonkan/: [انگلیسی] ☜ **زُنکن**

**زه** ¹ / zeh ، ـها/: *اسم.* ١. ژە؛ ژەهـ ؛ زە؛ ژێ؛ ڕیخۆڵەی بادراوی چوارپێ ٢. زێ؛ شریتەیێ کە بۆ ڕاگرتن و پاراستنی شتێک پێوەوەی دەبەستن ٣. ژێ؛ ژی؛ ژێکەوان؛ ژە؛ ژهـ ؛ ڕیخۆڵەی بادراو کە دوو سەری کەوان پێکەوە دەبەستێ ٤. ژێ؛ تاڵی ساز ٥. کەناو؛ تکاو؛ شوێنێ کە ئاوی کەمی لێ دەردەچێ و بۆ خاڵی کردنی ئاوی سەرئەرزی چێ‌کراوە ٦. تانی تەون.

⊡ زه زدن: *[گفتاری]* ١. پەیمان شکاندن؛ بەڵێن شکاندن؛ هەڵوەشاندنەوەی بەڵێن ‹رفقا زه زدند و مرا جا گذاشتند: دۆستان پەیمانیان شکاند و بەجێیمیان هێشت› ٢. کار بەجێ‌هێشتن؛ کار نیمەکار داخستن؛ ناتەواو جێ‌هێشتنی کاری وەئەستۆگیراو ‹به همین زودی خسته شدی و زه زدی؟: هێندە زوو ماندوو بووی و کارەکەت بەجێ هێشت؟›.

**زه** ²: *صوت. [ادبی]* چاک؛ ئافەرین؛ بژی؛ هەی

بـڕی؛ بارەقەڵـلا؛ ئافـەرەم؛ بەهـ ؛ بـەخ؛ چـاوی خودای پێوە بێ؛ وشەی پێهەڵگوتن ‹فلک گفت: احسن، ملک گفت: زه!: فەلـەک گـوتی: ئافـەرین، مەلەک گوتی: هەی بژی!›.

**زهاب** / zehāb/: *اسم.* زەهاو؛ ئاڤزەهـ : ۱. ئـاوێ کە لە ژێر زەوییەوە هەڵدەقوڵێ و ڕووی زەویـن دادەپۆشێ ۲. زناو؛ زنـە؛ زۆنـگ؛ زۆنـج؛ زۆنکـاو؛ زۆنگاو؛ زەنەک؛ تەڕازان؛ قۆپیە؛ زۆهـۆر؛ ئـاوەزۆ؛ ئاوەزا؛ شوێنی ئاوەزێ.

**زهاد** / zohhād/: [عربی] جمعِ ☜ **زاهِد**

**زهـار** / zehār/: [عربـی]/*اسـم.* زارگـا؛ زارەگـا؛ بەرگەدە؛ بانەگە؛ پانەگا؛ بـەر؛ شـەرم؛ شـەرمگە؛ شەرمگا؛ وەر.

**زهانـدن** / zehāndan/: *مـصدر. متعـدی. [قـدیمی]* ڕەوان‌کردن؛ خستنە گەڕ؛ شـیاندن؛ هەڕکانـدن (بۆ تراو بەتایبەت ئاو و شیر). هەروەها: **زهانیدن**

**زهتـاب** / zehtāb ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ۱. ژێڕێـس؛ ئەوەی لە ڕیخۆڵـەی چوارپێیـان تاڵـگەلی قـایم چێ دەکا ۲. ڕاچێن؛ داچێن؛ کەسێ کـە بـەنی ڕایەڵی تـەون تـەیار دەکـا؛ کەسـێ کـە تـەون دەنێتەوە.

**زهتابی** / zehtāb/: *اسم.* ڕاچێنەری؛ داچێنـەری؛ ژێڕێسی؛ کار یان ڕەوتی ڕاچاندن

**زهد** / zohd/: [عربی]/*اسم.* پارێزکاری؛ هەبیـسی؛ هەریسی؛ تەرکەدنیایی؛ تاییمی؛ پارسـایی؛ کـار یان ڕەوتی دووری‌گرتن لە کارگەلی دزێو.

**زهدان** / zehdān ، ـها/: *اسم.* پـزدان؛ پیـزەدان؛ زێـدان؛ پـاور؛ مناڵـدان؛ مندالـدان؛ بەچـەدان؛ بێچوودان؛ مالبچویـک؛ تیزانـگ؛ ڤـاگینا؛ زاگـە؛ زامـار؛ بـز؛ پـزان؛ پـاوەرە؛ کاردانـک؛ هەڵـپەز؛ پـڕزانگ؛ هاوبـاز؛ یاگۆزاولـەی؛ ئەنـدامێک لـە گوانداڕانی مێوینەدا کە تۆلی تێدا گەورە دەبێ و تا هاتنە دنیاوە تێدا دەمێنێ.

**زهر** / zahr ، ـها/: *اسم.* زەهـر؛ ژەهـر؛ ژیـەر؛ ژار؛ ژەحر؛ جەحر؛ ژاڵ؛ زل؛ مەرگـە؛ هـەر کـام لـەو ماکانەی کە بڕێ گیانەوەر و گیا بەرهەمی دێنن و زۆرتر لـە ڕێـی کاردانەوەیـەکی کیمیـایی لـە لەشی گیاندارێکـدا دەبێتـە هـۆی مـەرگ یـان ژاراوی بوونی.

◙ **زهر قاتل:** ژەهری کوژەر؛ ژاری بکوژ؛ زەهری کوشندە.

**زهر مار:** زەهرەمار؛ زەهرمار: ۱. ژەهری مـار؛ ژاری مار؛ ماکی ژەهری کە لـە کیـسەی لای چـزی مارگـەلی ژەهردارەوەیـە ۲. *[کنـایی]* زەهری هەلایل؛ ژەهـری هـەلایل؛ شـتی زۆر تاڵ و ناحەز ‹این چه زهرماری بود دادی خوردم؟: ئەمـە چ زەهرەمارێ بـوو داتـە دەرخـواردم؟› ۳. ژەهرەمـار؛ سـندان؛ قوزلـقورت؛ ژەقنـە؛ ژەقنەمووت؛ ژەقنەبووت؛ سنان؛ دەردی‌کاری؛ دەری؛ زەهری هەلاهەل؛ گەڕانی؛ زەبرەبەنـد؛ جۆرە جنێوێکە لە وەرامدانەوە بـە قـسە یـان پێکەنینی نابـەجێی کەسـێک ‹بلی و زهرمار! خجالت نمی‌کشی؟: بەلێ و زەهرەمار! داناڕزی؟›.

**زهـر هلاهـل:** *[کنـایی]* هەلایهـەل؛ ژەهـری هەلایهەل؛ ژەهری گیانلەبەری دیرۆکـان کـە گوایە زۆر بکوژە.

◙ **زهر چشم گرفتن:** *[مجازی]* ئـاو چـاو سـەندن/ گـرتن؛ جووجکـە ترسـێن/ منـداڵ ترسـێن کردن؛ ترساندن ‹مدیر تازه از بچه‌ها حسابی زهر چشم گرفت: بەڕێوەبەری تازە بە تەواوی ئاو چاوی هەواڵەکانی سەند›.

**زهـر خـود را ریخـتن:** *[مجـازی]* چـزی خـۆ وەشاندن؛ ئازاری خۆ گەیانـدن؛ دەسـتی خـۆ وەشاندن؛ لە کەسـێکەوە ئـازار و زەرەرێ کـە چاوەڕوانی دەکرا، گەییشتن ‹آرام با دروغی که گفت زهر خودش را ریخت و پیرمرد بیچاره را پریشان و دلشکسته کرد: ئارام بەو درۆیەکردی، چزی خۆی وەشـاند و ئـەو پیرەمێـردە هـەژارەی پەشـێو و دلشکاو کرد›.

**زهـر دادن:** ژار پێـدان؛ دەرمـانخواردکردن؛

ژاراوی‌کردن؛ ژار دانە دەرخوارد ‹سگ بیچاره را زهر داده بودند: سەگە بەستەزمانەکەیان ژار دابوو›.
زهر کردن:*[کنایی]* کردنە ژار؛ لێ‌کردن بە ژار؛ لێ‌تاڵ‌کردن؛ ڕەش‌کردن؛ کردنە زەهرمار؛ ئازاردەر و ناخۆش کردنی ژیان ‹او با رفتارش زندگی را به همه‌ی ما زهر کرده بود: بە ئاکاری خۆی ژیانی لێ کردبووین بە ژار›.
زهرمار کردن:*[تعریض]* کردنە زەهرەمار؛ کردنە زەهر؛ کردنە ژەقنە؛ خواردن (بۆ سووکایەتی و ناسزا) ‹یک کاسه‌ی پر آش رشته زهرمار کرده، باز می‌گوید گرسنه‌ام!: کاسەیەک ئاش ڕشتەی کردووە زەهری ماری و هێشتا دەڵێ برسیمە!›.
**زهرآگین** / zahrāgîn/: *صفت.[ادبی]* ۱. ژاراوی؛ ژەهراوی؛ زاراوی؛ تێکەڵ بە ژەهر ۲. زۆر تاڵ و ناحەز ☼ **زهرآلود**
**زهرآلود** / zahrālûd/ ☜ **زهرآگین**
**زهراب** / zahrāb/: *اسم.[گفتاری]* میز؛ مێز؛ گمێز؛ زاراو.
**زهرابه** / zahrābe، ـها/: *اسم.* ناراو؛ ژەهراو؛ زەهراو؛ ژاراو؛ زاراو: ۱. توکسین؛ بەرهەمی ژاراوی باکتری یا خانک‌گەلی‌تر کە بە وەشاندنیان لە لەشی گیانداران، دەبێتە هۆی دروست بوونی دژەژار ۲. تراوی ژاراوی کە لە شتێکەوە دەدەڵێت.
**زهرخند** / zahrxand:/*اسم.[مجازی]* زارخەن؛ ژارخەن؛ خەندەی تاڵ؛ زارخەنە؛ زەهرخەنە؛ پێکەنینی تاڵ و ناحەز لە بەر تووڕەیی و قەڵسی.
**زهرشناسی** / zahršenāsî/: *اسم.* ژارناسی؛ زانستێ کە لە سەر ژەهر و کاریگەری و بابەتگەلی (کیمیایی و پیشەیی و حقووقی) پێوەندیدار بە ژەهر دەکۆڵێتەوە: **سم‌شناسی**
**زهره** / zahre/: *اسم.* ۱. کیسەی صفرا ☜ **کیسه** ۲. *[مجازی]* وره؛ زارە؛ زات؛ نەترسی؛ جربزە؛ دلێری؛ ئەترەش؛ هەترەش؛ ئازایی؛ ورار؛ زاڵە؛ زەڵە؛ زیەلگ؛ زاوەر؛ زاور؛ زروا؛ زەنەق؛ زەندەق؛ زەهلە؛ زەهلک؛ پشتووری؛ نەترە.
▣ زهره داشتن:*[مجازی]* زات هەبوون؛ ئازا بوون؛ زەنەقدار بوون؛ بوێر بوون؛ دلێر بوون؛ ورەدار بوون.
زهره‌ی کسی آب شدن:*[مجازی]* کەسێ زاڵەترەک بوون؛ زەنەقی کەسێ چوون؛ دڵی کەسێک تۆقان؛ زاڵەی کەسێک تۆقین؛ زاوڵەترەک بیەی؛ زاور چوون؛ لەنکاو زۆر ترسان و حەپەسان.
**زهره** / zohre/: [عربی]*اسم.* زوهره؛ زۆرە؛ ناهید؛ دووهەمین گەڕۆکی کۆمەڵەی خۆر لەباری نزیکی بە خۆرەوە کە خولگەکەی لە نێوان ساوە (تیر) و زەویندایە: **ناهید**
**زهره‌ترک** / zahretarak/: *صفت.[مجازی، گفتاری]* زارەترک؛ زاڵەترەک؛ زاوڵەترەک؛ زەلەقات؛ زەلەڕەتە؛ زەڵەتراق؛ زەندەق‌چوو؛ زەنەق‌چوو؛ زارەچوو؛ زراوچووگ؛ تۆقاو؛ زۆر ترساو و لێقەوماو لە کارەساتێک ‹بیچاره پیرمرد از صدای موشکها زهره‌ترک شد و مرد: پیرەمێردی هەژار لە گرمەی مووشەکەکان زارەترەک بوو و مرد›.
**زهکشی** / zehkešî، ـها/: *اسم.* ۱. زنەکێشی؛ کار یان ڕەوتی هەڵکێشانی ئاوگەلی ڕووەکی لە دەشتێکدا ۲. جۆگەگەلێ کە بۆ دەرکێشانی ئاوی زەلکاو و زەناو لە قەراخیانەوە دەکێشرێ ۳. کاری دروست‌کردنی زێوار.
**زهگیر** / zehgîr، ـها/: *اسم.* ژێگر؛ ژێگیر؛ ئەنگوستیلەی سەر پەنجە کە ژێی کەوانی پێ دەگیرێ.
**زهم** / zohm/: [عربی]*اسم.* بۆدر؛ بۆدرن؛ بۆسار؛ بۆنسارد؛ بۆی توندی گۆشتی نەکولیو بەتایبەت مریشک و ماسی.
**زهوار** / zehvār، ـها/: *اسم.* چوارچێوە؛ زێوارە؛ شریتە یا هۆندراوێکی باریک کە بۆ ڕازانەوە یان

پەوکاری دەیبەسنە لێوارەی شتێکەوە.

**زهواردررفته** / zehvārdar.rafte ، ـها/: *صفت. [کنایی]* ژێبڕاو؛ شەق و شڕ؛ دارِزاو؛ سەوەتەی پەتبڕیاگ.

**زهی** / zehî/: *صفت.* ژێدار؛ ژێیی؛ زەهی ‹ساز زهی: سازی ژێدار›.

**زهی** / zehî/: *صوت. [ادبی]* ئافەرین؛ ئافەریم؛ ئافەرەم؛ بەه ؛ بەهـ بەهـ ؛ بارەقەڵڵا؛ باریکەڵا؛ دەسخۆش؛ بەخ.

**زهیدن** / zahîdan, zehîdan/: *مصدر. لازم. متعدی. [قدیمی]* ☐*لازم.* ۱. قەمزتن؛ قەمستن؛ زانەوە؛ زیەی؛ زیای؛ هەڵقولان؛ هەڵقولیان؛ هەڵقوڵتان؛ هەڵقوڵتیان؛ هەڵقولین؛ جۆشیان؛ دەرپەڕینی ئاو دە زەوی ☐ *متعدی.* ۲. زان؛ زاین؛ زاییـن؛ زەی؛ زای؛ زەیش؛ زهین؛ زەهین؛ زەهان؛ زایەنە.

**زی**[1] / zî/: *حرف. [ادبی]* ۱. بەرەو؛ بەرەو لای؛ بۆ لای ۲. بە لای؛ لەکن؛ لای؛ لاو ۳. بۆ؛ ژبۆ؛ پەی؛ ئەڕای.

**ـــ زی**[2]: *پیواژه.* ـــ ژی؛ ژیـن بـە سـەر بـەر؛ زیندەگی‌کەر ‹آبزی: ئاوژی›.

**زیا**[1] / ziyā/: *اسم. [زیست‌شناسی]* ژیو؛ ژیاندار؛ زیندی؛ زیندوو؛ زینە؛ گیانەوەر؛ بوونەوەر، بەتایبەت گیانەوەرانی کۆمەڵێکی دیاریکراو.

**زیا**[2]: *صفت.* ژیو؛ ژیاندار؛ زینگ؛ زیندوو؛ زیندی؛ زینە.

**زیاد**[1] / ziyād/: [از عربی] *صفت.* زۆر؛ فرە؛ فراوان؛ فریە؛ فرێ؛ زەبەند؛ زەبەن؛ زەبەنگ؛ زیاد؛ زیای؛ زەحف؛ زاف؛ زاڤ؛ بۆش؛ پور؛ پڕ؛ مۆڵ؛ ئەنقەزە؛ گن؛ لەبەونی ‹کار زیاد: کاری زۆر›.

◘ **زیاد شدن:** زۆر بوونەوە؛ فرەوە بوون؛ فرە بیەی؛ فریە بوون؛ زیاد بوون؛ زاف بوون.

**زیاد کردن:** زۆرکردنەوە؛ فرەوەکردن؛ فرەکەردەی؛ زێدەکردن؛ زیاد کردن.

**زیاد**[2]: *قید.* زۆر؛ فرە؛ فریە؛ زیاد؛ زیای؛ گەلەکی؛ گەلێ؛ گەلەک؛ گەلێک ‹زیاد کار می‌کرد: زۆر کاری دەکرد›.

**زیاده**[1] / ziyāde/: [عربی] *قید.* زیادە؛ زێدە؛ زۆر؛ زۆرتر؛ زۆرتر لە ڕادەی ویستراو ‹زیاده نمی‌خواهم: زیادەم ناوێ›.

**زیاده‌ـ**[2]: *پیشواژه.* زیاـ؛ زیادەـ؛ زێدەـ؛ فرەـ؛ زۆرتر؛ زیاتر ‹زیاده‌طلب: زیاخواز›.

**زیاده‌خواهی** / ziyādexāhî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* زێدەخوازی؛ زیاخوازی؛ فرەخوازی. هەروەها: **زیاده‌خواه**

**زیاده‌روی** / ziyāderavî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* زێدەڕۆیی؛ زیاڕەوی؛ تەلاس؛ زێدەکاری؛ زۆرتر لەوەی پێویستە لە کارێکدا چوونە بەرەوە؛ کار یان ڕەوتی پای زیادە داکێشان ‹یک روز در خوابیدن زیاده‌روی می‌کند یک روز در شب زنده‌داری: ڕۆژێ لە خەوتندا زێدەڕەوی دەکا، ڕۆژێ لە شەونخوونیدا›.

**زیاده‌طلبی** / ziyādetalabî ، ـها/: [عربی] *اسم.* زیادەخوازی؛ فرەخوازی. هەروەها: **زیاده‌طلب**

**زیادی**[1] / ziyādî ، ـها/: [از عربی] *صفت.* زیادە؛ زیایی؛ زێدە؛ زاڤەی؛ زافی؛ زەحفی؛ فرەیی ‹آدم زیادی: مرۆی زیادە›.

**زیادی**[2]: *قید.* زیادی؛ زیایی؛ زۆر؛ زافەی؛ زاڤەی؛ لە ڕادە بەدەر؛ زۆرتر لە ڕادەی پێویست ‹زیادی حرف می‌زند: زیادی قسە دەکا›.

**زیارت** / ziyārat/: [عربی] *اسم.* ۱. *ـها/* زیارەت؛ کار و ڕەوتی چوونە سەر پیر، شوێنگەلی پیرۆز و گڵکۆی گەورە پیاوان ‹زیارت کعبه: زیارەتی کابە› ۲. دیەنی؛ دیمانە؛ دیدار؛ چاو پێکەوتن ‹به زیارت دوستان و آشنایان رفتیم: چووینە دیدەنی دۆستان و ئاشنایان›. هەروەها: **زیارت رفتن؛ زیارت شدن؛ زیارت کردن**

**زیارتگاه** / ziyāratgāh ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* زیوە؛ خزن؛ قسن؛ چاک؛ زیارەتگە؛ شوێنێ کە

کۆمەڵێک بە پیرۆزی دەزانن و دەچنە سەری.

**زیارتنامه / ziyāratnāme**، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم/ زیارەتنامە: ۱. دوعایێ تایبەت کە لە کاتی چوونە سەر مەرقەد یان شوێنێکی پیرۆز دەیخوێنن ۲. نووسراوەیەک کە ئەو دوعایەی تێدایە.

**زیارتی / ziyāratî**/: [عربی] صفت. زیارەتی: ۱. پیرۆز؛ شیاوی زیارەتکردن ۲. پێوەندیدار یان سەر بە چاوپێکەوتنەوە.

**زیان / ziyān**، ـها/: /اسم/ زیان؛ زان؛ زەرەر: ۱. خوسار؛ خەسار؛ خەسارەت؛ نەستیل؛ زەڕ؛ زێون؛ کاری لە دەسدانی شتێ بایەخدار ‹زیان کردن: زیان کردن› ۲. ئاسیب؛ خوسار؛ خەسار؛ خەسارەت؛ گەزەنێ کە دەبێتە هۆی فەوتانی شتێکی بایەخدار ‹خشکسالی موجب زیان کشاورزان شد: وشکەساڵی بوو بە هۆی زیانی وەرزێڕان› ۳. شتێکی بایەخدار کە بفەوتێ ‹یک میلیون زیان کردیم: ملیۆنێ زەرەرمان کرد›.

▣ زیان بردن ☜ **زیان کردن**

زیان داشتن: زەرەر هەبوون؛ زیان هەبوون؛ زیاندار بوون؛ گەزەندار بوون؛ زەڕدار بوون؛ هۆی زەرەرگەیاندن یان لە دەست چوونی شتی بەنرخ ‹معاملەی چای برایمان زیان داشت: مامەڵەی چایی زەرەری هەبوو بۆمان›.

زیان دیدن: ۱. زیان کردن؛ زەرەرکردن؛ لە دەست دانی بەشێ لە ماڵ و سامان ‹در آن معامله چند میلیون زیان دیدیم: لەو سەودایەدا چەند میلیۆن زیانمان کرد› ۲. گەزن دیتن؛ ئاسیب دیتن؛ خەسار دیتن؛ زیان پێگەیشتن ‹کشور از جنگ زیان می‌بیند: وڵات لە شەڕ گەزن دەبینێ›.

هەروەها: **زیان زدن؛ زیان رساندن؛ زیان وارد کردن**

زیان کردن: زەرەرکردن؛ زیان کردن؛ خەسار دیتن؛ لە دەست دانی ماڵ و سامان ‹در فروش خانه خیلی زیان کرد: لە فرۆشتنی ماڵەکەدا زۆری زەرەر کرد›.

**زیان‌آور / ziyānāvar**/: صفت. خەسارەدەر؛ زیانیدەر؛ وەزەنۆک؛ زیاندار؛ هۆی خەسارادانی شتی بەنرخ ‹فاضلاب‌ها دارای مواد زیان‌آور برای محیط زیست هستند: فازلاوەکان لە خۆگری ماکی خەساردەر بۆ ژینگەن›.

**زیانبار / ziyānbār**/ ☜ **زیان‌آور**

**زیانبخش / ziyānbaxš**/ ☜ **زیان‌آور**

**زیانکار / ziyānkār**، ـها؛ ـان/: صفت. زیانۆک؛ زیانەخورۆ (بۆ ئاژەڵ)؛ زیانکار؛ گەزەندار؛ زەرەردار؛ زیاندار؛ لێهاتوو یا خووگرتوو بە زەرەرگەیاندن ‹موش جانور زیانکاری است: مشک گیانلەبەرێکی زیانۆکە›.

**زیانکاری / ziyānkārî**، ـها/: /اسم/ زیانی؛ زیانکاری؛ زیانۆکی؛ کار یان ڕەوتی زەرەر و زیان دان لە خەڵک ‹دیروز که خانه نبودیم، بچه‌ها خیلی زیانکاری کرده بودند: دوێنێ کە لە ماڵ نەبووین منداڵەکان زۆر زیانیان دابوو›.

**زیب / zîb**/: /اسم/ [ادبی] ڕازێنە؛ زەمبەر؛ ڕەوش؛ خشڵ؛ چەک.

**زیبا / zîbā**/: صفت. جوان؛ شەنگ؛ زیبا؛ زێبا؛ زیوا؛ قەنج؛ قەشەنگ؛ بازڕە؛ بافرە: ۱. گوزەڵ؛ زیکەلانە؛ بەدەو؛ دەلال؛ کەلەش؛ ڕەنگین؛ چەلەک؛ خاوەن دیمەنی دڵخواز ‹باغ زیبا: باخی جوان› ۲. ـها/ شێن؛ کەلان؛ سەلارە؛ زەری؛ رند؛ سپەهی؛ گوزەڵ؛ خوشیک؛ خوشکۆک؛ ژیکەلانە؛ بەدەو؛ خاڵخاش؛ دەلال؛ گەزاڵ؛ خومخوم؛ جوانچاک؛ جندی؛ ڕەنین؛ خنج و خۆل؛ خنج و منج؛ خۆش‌سیما؛ جوانکیلانە ‹زن زیبا: ژنی جوان› ۳. چەلەک؛ کەلەش؛ لەبەردڵ؛ دلگر؛ بە چۆنیەتیەکی چاک و دڵپەسندەوە ‹آهنگ زیبا: ئاهەنگی جوان›.

**زیبائی / zîbā'î**/ ☜ **زیبایی**

**زیباپسند / zîbāpasand**، ـها؛ ـان/: صفت. جوانپەسەن؛ خاوەن چێژەی نرخاندن و چێژە

وەرگرتن لە جوانی.

**زیبارو** / zîbārû ، ـیان/: *صفت.* جوان‌چاک؛ سۆرپەری؛ لەڤەند؛ شیرین‌شێوە؛ شێوەشیرین؛ جوان‌چاڵ؛ جوان‌خاس؛ جوان‌شیرین؛ خوشیک؛ شێن؛ ژیکەلانە؛ بەدەو؛ دەلال؛ جندی؛ قشت؛ قشتیلە؛ خۆش‌سیما؛ جوانکیلانە؛ زەری؛ سەلارە؛ کەلان؛ سپەهی.

**زیباسازی** / zîbāsāzî/: *اسم.* جوانکاری؛ خەملکاری؛ کار یان ڕەوتی جوان‌کردنی شوێنێ، زۆرتر بە ڕازاندنەوە ‹زیباسازی شهر: جوانکاری شار›.

**زیباشناسی** / zîbāšenāsî/ ☜ **زیبایی‌شناسی**

**زیبایی** / zîbāyî ، ـها/: *اسم.* جوانی؛ قۆزی؛ چۆنیەتی یان بار و دۆخێ لە شتێکدا کە دەبێتە هۆی ڕاکێشانی سەرنج و هۆگری و چێژ لێ‌گرتنی ‹زیبایی صورت: جوانی ڕوومەت›: **زیبائی**

◘ **زیبایی صوری**: ڕەوش؛ جوانی ڕواڵەتی؛ جوانیێ کە بە چاو دەبینرێ.

**زیبایی معنوی**: جوانی سەرچاوەگرتوو لە بایەخگەلی وەرگیراو لە لایەن کەس یان تاقمێکەوە.

**زیبایی‌شناختی** / zîbāyîšenāxtî/: *صفت.* جوانی‌ناسیانە؛ پێوەندیدار بە جوانی‌ناسیەوە.

**زیبایی‌شناسی** / zîbāyîšenāsî/: *اسم.* ۱. جوانی‌ناسی؛ لقێ لە فەلسەفە کە لەمەڕ چیەتی جوانی، هونەر، زەوق، ئافراندن و هەڵسەنگاندنیان دەکۆڵێتەوە ۲. بۆچوونێکی تایبەت لە بارەی جوانی و هونەرەوە * **زیباشناسی**

**زیبق** / zeybaq/: [معرب از فارسی]*اسم.[قدیمی]* ژووڤە؛ جیوە.

**زیبندگی** / zîbandegî/: *اسم.* لەباری؛ ڕازاوەیی؛ پێکەوتوویی؛ جوانی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شیاو و لە بەر دڵان بوون.

**زیبنده** / zîbande/: *صفت.* جوان؛ لەبار؛ ڕازاوە؛ شیاو؛ پێکەوتوو؛ باش؛ چاک ‹رفتار زیبنده‌ی یک مرد: ئاکاری لەباری پیاوێک›.

**زیب‌وزیور** / zîb-o-zîvar/: *اسم.* خشڵ و زەمبەر؛ زێڕ و زەمبەر؛ ڕەوش؛ شتی ڕازێنەیی و متومۆرووی جۆراوجۆر کە بۆ زێدەکردنی جوانی و شکۆ کەڵکی لێ‌وەردەگرن.

**زیبیدن** / zîbîdan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* پێکەوتن؛ پێکەفتن؛ لێ‌جوان بوون؛ پێ‌شیان؛ شیان؛ لێهاتن؛ پنەکەوتەی؛ پەنەکەوتەی؛ پنەشیەی؛ پەنەشیای؛ شیەی؛ شیای؛ پنەئامەی؛ پەنەئامای: ۱. ڕازاوە بوون ‹این جامه به تو می‌زیبد: ئەم گنجەت پیدەکەوی› ۲. بۆ بوون؛ لێ‌وەشانەوە؛ پێ‌ڕەوان بوون؛ بۆ لەبار بوون؛ ژ هەژی بوون؛ ب سەرڤە بوون؛ شیاو و ڕەوا بوون ‹این کارها به او نمی‌زیبد: ئەم کارانەی پی‌ناکەوی›.

■ صفت فاعلی: **زیبنده** (ـ)/ مصدر منفی: **نزیبیدن** (پێنەکەوتن)

**زیپ** / zîp ، ـها/: [انگلیسی]*اسم.* زیپ؛ چورت؛ قیر؛ جۆرێ بەس (بۆ هەڵپێکانی جل‌وبەرگ، کیف و ...) بریتی لە دوو ڕز ددانە و گیرەیێ کە بە کێشانی بەرەو لایێ دەبەسرێ و بەرەو لایەکی‌تر دەکرێتەوە.

**زیپو** / zip(p)o/ ☜ آب زیپو، **آب**

**زیتون** / zeytûn ، ـها/: [عربی]*اسم.* زەیتوون: ۱. دارچکێک بە کۆتەرەی لێک‌ئالا و لق و پۆدار، گەڵای سەوزی بریقەدار و پشت زێویەوە ۲. بەری ئەو دارچکە کە گۆشتن، چکۆلە، خۆراکی، زرو، ڕەش یان سەوزە و ڕۆنیشی لێ‌دەگرن.

◘ **زیتون تلخ** ☜ **سنجدتلخ ـ۲**

**زیتونی**[1] / zeytûnî/: [عربی]*اسم.* زەیتوونی؛ کەسکەتاری؛ ڕەنگی سەوزی وەکوو ڕەنگی زەیتوون. هەروەها: **زیتونی‌رنگ**

**زیتونی**[2]: *صفت.* زەیتوونی؛ کەسکەتاری؛ بە ڕەنگی زەیتوون.

زیج / zîc ، ـها/: [معرب از فارسی]/اسم./قدیمی/ زیگ؛ ستێری؛ سەرجەمی ئەو ماڵکانە کە جێگەی ئەستێرە و گەڕۆکانی لە ڕۆژانی ساڵدا پیشان داوە و هەروەها زانیاریتری ئەستێرەناسی تێدابوو.

◘ زیج بستن: زیگ بەستن؛ ئامادەکردنی زیگ.

زیج نشستن:/مجازی/ کونج گرتن؛ گۆشەگرتن؛ گۆشەنشینی هەڵبژاردن.

زیدی / zeydî/: صفت. زەیدی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە ڕێبازی زەیدیە ٢. /ـها/ شوێنکەوتووانی ئەو ئایینە.

زیدیه / zeydîyye/: [عربی]/اسم./شیعه/ زەیدیە؛ ڕێبازێکی ئیمامیە کە شوێنکەوتووانی زەید کوڕی زەینولعابدین، بە ئیمامی نادیار دەزانن.

زیر / zîr ، ـها/:/اسم. ١. ژێر؛ ژێڵ؛ زیل؛ ژیل؛ چێر؛ بن؛ ناو؛ تۆ؛ دلێ؛ ناوەوە ‹زیر زمین: زێر زەوی› ٢. ژێر؛ ژێڵ؛ ژیل؛ زیل؛ چێر؛ لایێ کە بەرەو خوار یان بەرەو زەویە ‹زیر میز: ژێری مێز› * بەرانبەر: رو ٣. ژێرە؛ نیشانەیەکی ئاوایی کە دەکەوێتە ژێر پیتەوە و مەکسووری دەکا (وەک پیتی ک و ب لە وشەی «کِتاب»دا. ئەم نیشانە لە ڕێنووسی کوردیدا / / جێی گردۆتەوە): **کسره**

◘ زیر کردن: کردنە ژێرەوە؛ ئەرەشێلەی؛ سەرەنە لوەی؛ دان لە شتێ یان کەسێک؛ بە ماشێن یان هەر ئاژۆیەکی تر، لە سەر کەسێک یان شتێکەوە چوون یان ئازار پێگەیاندنی ‹گربەی بیچارە را با دوچرخە زیر کرد: ئەو پشیلە بەستەزمانەی بە دووچەرخە کردە ژێرەوە›. هەروەها: **زیر گرفتن**

زیر: صفت. زیل؛ زیل؛ زیڕ؛ زیک؛ زیق؛ ناسک؛ دەنگی تیژی باریک بە فریکانسی زۆرەوە (وەکوو دەنگی منداڵ). بەرانبەر: **بم**

زیر: قید. ژێر؛ چێر: ١. لە خوارەوەی شتێکدا ‹زیر میز: ژێر مێز› ٢. لە بەشی ناوەکی یان پشتی هەر شتێکدا ‹زیر لباس: ژێر جلوبەرگ›.

◘ زیر بغل: ژێرباڵ؛ بن‌باڵ؛ بن‌باخەڵ؛ بن‌باغەڵ؛ بن‌دەست؛ بنکەش؛ بنوباڵی؛ چێرووکەشی؛ هەنگڵێ: ١. کەوش؛ کەش؛ بن‌هەنگەڵ؛ ناقچەنگ؛ بنەنگڵ؛ گورچک؛ واوش؛ قووڵایی نێوان سنگ و باسک لە ژێر شاندا ٢. کەفش؛ بن‌کەوش؛ ئەو تیکە لە جلوبەرگ کە دایدەپۆشێ.

زیر پله(ای): ژێر پلە؛ ژێر پلیکان؛ بۆشاییەک (وەک دیو یان هەمبار، ...) کە لە ژێر پلیکاندا بەدی دێ.

زیر جلدی: ژێر پێستی؛ لە ژێر پێستدا.

زیر خاکی ☜ **زیرخاکی**

زیر قیمت: ژێر بایی؛ ژێر نرخ؛ کەمتر و هەرزان‌تر لە بایی ڕاستەقینەی خۆی ‹همە را زیر قیمت فروخت و خیلی ضرر کرد: هەمووی بە ژێر بایی فرۆشت و زۆری زەرەر کرد›.

◘ زیر ابرو برداشتن ☜ ابرو برداشتن، **ابرو**

زیر اخیه کشیدن:/کنایی/ تەنگ پێ‌هەڵچنین؛ تەنگ پێ‌هێنان؛ خستنە تەنگ و تاوەوە؛ خستنە تەنگانەوە؛ گوشار بۆ هێنان و ڕیپ بۆ هاوردن.

زیر آوار ماندن: بوونە ژێر سەخمەوە؛ لە ژێر ئاواردا مانەوە؛ بە هۆی ڕووخانی ماڵ، لە ژێر دار و پەردوودا گیرکردن.

زیر بار (چیزی) رفتن:/کنایی/ چوونە ژێر بار؛ مل دان: ١. وەرگرتن؛ مل پێدا کردن؛ چوونە ژێر؛ قەبووڵ‌کردن ‹هر چە گفتم، زیر بار نرفت: هەر چەند گوتم، ملی نەدا› ٢. کار یان دۆخی دژوار هەڵگرتن ‹زیر بار قرض رفتن: چوونە ژێر باری قەرز›.

زیر بال کسی را گرفتن:/کنایی/ دەست دانە ژێر باڵی کەسێکدا؛ دەس و باڵی کەسێک گرتن؛ یارمەتی کەسێک دان ‹وقتی از اداره اخراج شد دوستان زیر بالش را گرفتند و برایش کاری پیدا کردند: کاتێ لە مەزرینگە دەرکرا، دۆستان

دەستیان دایە ژێر باڵی و کارێکیان بۆ دۆزیەوە›.

**زیر بال گرفتن:** *[کنایی]* لە ژێر پەڕ و باڵ گرتن؛ خستنە ژێر پەڕ و باڵ؛ حەواندنەوە؛ پشتیوانی‌کردن؛ پشت‌گرتن؛ ژێر باڵ گرتن؛ هاوپشتی‌کردن ‹بچەهای برادرش را زیر بال گرفت و بزرگشان کرد: منداڵەکانی براکەی خستە ژێر پەڕ و باڵی خۆی و گەورەیانی‌کرد›.

**زیر بته عمل آمدن:** *[مجازی، تعریض]* لە بن تەپاڵە/ کوچکەوە دەرهاتن؛ لە ژێر تووڕگ دەرهاتن؛ بێ‌باوک و دایک یان بێ‌بنەماڵەییەکی باش بوون ‹خیال می‌کند بقیە زیر بتە عمل آمدەاند: وادەزانێ ئەوانی‌تر لە بن تەپاڵەوە دەرهاتوون›.

**زیر بغل زدن:** دانە بن‌باڵ؛ دانە بن‌باخەڵ؛ دانە بن دەست؛ بن‌باخەڵ دان؛ دەی چێرووکەشی؛ نانە بەین باسک و لاپاڵ هەڵگرتن ‹کتاب را زیر بغل زد و برد: کتێبەکەی دایە بن باڵی و بردی›: **بغل زدن**

**زیر بغل کسی هندوانه دادن/ گذاشتن:** *[کنایی]* با کردنە قول کەسێک؛ شووتی دانە ژێر باڵی کەسێک؛ گونی کەسێک نانە تەرازوو؛ کەسێک لەخشتە بردن؛ فیز و هەوا دان بە کەسێک ‹آن‌قدر هندوانە زیر بغلش دادند تا رفت و خودش را بە کشتن داد: ئەونە بایان کردە قولی هەتا چوو و خۆی بە کوشت دا›.

**زیر پا کشی کردن** ☜ **زیرپاکشی**

**زیر پا گذاشتن:** *[کنایی]* ١. ژێر پێ نان؛ پاشێل کردن؛ پێشێل کردن؛ بەر پێ‌خستن؛ بایەخ نەدان؛ بێ‌بایەخ‌کردن؛ بایەخ پێ‌نەدان؛ سووک لێ‌نەوین ‹دوستی سی سالە را زیر پا گذاشت: دۆستایەتی سی ساڵەی نایە ژێر پێ› ٢. دانە پاوە؛ وشکنەی؛ گەڕان، بەتایبەت بە شوێنی شتێکدا ‹تمام شهر را زیر پا گذاشت، کتاب را پیدا نکرد: تەواو شاری دا پاوە، کتێبەکەی نەدۆزیەوە›.

**زیر پا لە کردن:** هەرستاندن؛ هەرستین؛ پێ ڕێخستن؛ پلیشاندنەوە؛ لە ژێر پێدا پلچاندن؛ دەبەر پێدا پان‌کردنەوە.

**زیر پای کسی انداختن:** ١. خستنە بەر پای کەسێک؛ لە ڕێی کەسێکدا ڕاخستن ‹یک قالی انداختە بودند زیر پایشان: قالییەکیان خستبووە بەر پایان› ٢. خستنە ژێر پای کەسێ؛ شتێ دانە دەستی کەسێکەوە ‹یک ماشین نو را انداختم زیر پایت: ماشێنێکی تازەم خستە ژێر پێت›.

**زیر پای کسی پوست خربزه گذاشتن:** *[مجازی]* سابوون دانە ژێر پای کەسێک؛ پیلانگێڕی‌کردن لە کەسێک بۆ بەزاندن یان بێ‌ئابڕوو کردنی ‹پوست خربزە زیر پای رییس گذاشتند و باعث عزل او شدند: سابوونیان دایە ژێر پای ڕەییس و بوونە هۆی لابردنی›.

**زیر پای کسی را جارو کردن:** *[کنایی]* ئاو کردنە ژێر کەسێ؛ جێ بە کەسێ لێژ/ تەنگ کردن؛ کردنە کارێ کەسێ شوێنی خۆی بە جێ بێلێ ‹از راه نرسیدە زیر پای مادرشوهرش را جارو کرد و او را بە خانەی دخترش فرستاد: ڕێوڕا ئاوی کردە ژێر پای خەسووی و ناردی بۆ ماڵی کچەکەی›.

**زیر پای کسی علف سبز شدن:** *[مجازی]* ژێر پێی کەسێک چەکەرەدان؛ ژێر پێی کەسێ سەوز بوون؛ چاوەڕوانی زۆر و بێ‌کەڵک کردن ‹این‌قدر بایست تا زیر پایت علف سبز شود: ئەونەدە ڕاوەستە تا ژێر پێت چەکەرە بدا›.

**زیر پای کسی نشستن:** *[کنایی]* چوونە بن کلێشەی کەسێکەوە؛ پێ‌داگری بۆ ڕازی‌کردن و هاندانی کەسێ بۆ جێبەجێ‌کردنی کارێ ‹آرام زیر پایم نشست و مرا راهی تهران کرد: ئارام چووە بن کلیشەمەوە و ناردمی بۆ تاران›.

**زیر پوست کسی آب رفتن:** *[مجازی]* ڕەنگ و ڕووی کەسێ کرانەوە؛ ئاو زانە ژێر پێستی کەسێ؛ بە خۆدا هاتن؛ زۆر شاد و گەش و

سەرحاڵ بوونەوە ‹وقتی از سفر برگشت زیر پوستش اب رفته بود: کاتێ لە سەفەر هاتەوە رەنگ و رووی کرابووەوە›.

زیر جلکی/ جلی کار کردن ☜ زیرجلکی

زیر چشمی نگاه کردن: لە ژێر چاوەوە ڕوانین؛ بە دزیەوە تەمەشاکردن؛ چێرەنە دیەی.

زیر چیزی رفتن/ ماندن: ۱. بوون بە/ بوونە ژێر شتێکەوە؛ چوونە ژێر شتێک؛ پێکدا دان؛ دان لە یەک ‹گربە رفت زیر ماشین و مرد: پشیلەکە بووە ژێر ماشینەوە و تۆپی› ۲. *[کنایی]* قورسایی و سەخڵەتی شتێ وەئەستۆگرتن.

زیر چیزی زدن: *[مجازی]* ۱. دانە ژێر شتێکدا؛ نکوولی کردن لە شتێ ‹وقتی از آزاد پرسیدم زیرش زد و گفت: من این حرف را نزدەام: کاتێ لە ئازادم پرسی، دایە ژێریدا و گوتی: من ئەم قسەیەم نەکردووە› ۲. دانە ژێر قەولێکدا؛ لە ژێر قەولێک دەرچوون؛ لە بەڵێنێک پاشگەز بوونەوە ‹آدم نباید زیر قولش بزند: پیاو نابێ بداتە ژێر قەولی خویدا› ۳. دان لە شتێک؛ دانە ژێر شتێکدا؛ لە ناکاو دەست پێکردنی کارێ (وەک پێکەنین، گریان و ...) ‹تا این را گفتم، زد زیر خندە: هەر کە ئەمەم گوت، دای لە قاقای پێکەنین›.

زیر دست (کسی) بودن ☜ زیردست

زیر دست و پا افتادن: کەوتنە ژێر دەست و پێ/ پاوە؛ داکەوتن؛ بە هۆی سەرنج نەدان کەوتنە شوێنێکی نەگونجاو و بەر بە هاتوچۆ گرتن یان بە هاتوچۆی خەڵکەوە خەسار دیتن.

زیر دست و پا ریختن: *[کنایی]* ڕژان؛ فراوان بوون؛ زۆر بوون؛ ڕژانە نێو دەست و پاوە؛ فرە و فراوان بیەی؛ مشەمەر بیەی ‹آنجا لوازم خانگی زیر دست و پا ریختە بود: ئەوێ کەلپەلی ماڵی لێ ڕژابوو›.

زیر دل کسی را زدن: *[مجازی]* دان لە دڵی کەسێک؛ کەسێک بێزارکردن.

زیر دندان کسی مزە کردن: *[کنایی]* مەزەی چوونە ژێر ددانی کەسێک؛ دەمەچێشتە بوون؛ خۆش لە شتێک هاتن و کەوتنە تەمایەوە ‹پول مفت زیر دندانت مزە کردە: مەزەی پارەی مفت چوتە ژێر ددانت›.

زیر دین کسی بودن: ۱. *[مجازی]* لە ژێر منەتی کەسێکدا بوون؛ لە باری مرۆڤایەتیەوە پێبەندی کەسێ بوون ۲. قەرزداری کەسێک بوون؛ لە ژێر قەرزی کەسێکدا بوون.

زیر زبان کسی را کشیدن: *[مجازی]* سەر کەسێ داکێشان؛ لە ژێر زمانی کەسێک کێشانەوە؛ لە کەسێک کێشانەوە؛ بە زمان چەوری و فێڵ و فریو نهێنیەک لە کەسێک کێشانەوە ‹زیر زبان او را بکش، ببین دیروز کجا رفتە؟: سەری داکێشە، بزانە دوێنێ بۆ کوێ چووە؟›.

زیر سایەی کسی بودن: *[مجازی]* لە سایەی کەسێکدا بوون؛ لە ژێر سێبەری کەسێکدا بوون؛ لە یارمەتی و پشتیوانی کەسێک کەڵک وەرگرتن ‹زیر سایەی شما وضعمان بد نیست: لە سایەی ئێوەوە حاڵ و باڵمان خراپ نیە›.

زیر سبیلی در کردن: *[مجازی]* بە ڕوودا نەهێنان؛ نەهێنانە ڕوو؛ هەڵە یان گوناحی کەسێک لە بەر چاو نەگرتن ‹خوب شد مدیر با این کە فهمیدە بود زیر سبیلی درکرد و چیزی نگفت: چا بوو هەر چەن بەڕێوەبەریش زانیبووی، بەڵام بە ڕوویدا نەهینا و هیچی نەگوت›.

زیر سر داشتن: *[کنایی]* لە ژێر سەردا بوون؛ نانەوە؛ شک بردن؛ زووتر ئامادە بوون ‹چند تا خواستگار پولدار زیر سر داشت: چەن داواکاری دەوڵەمەندی لە ژێر سەردا بوو›.

زیر سر کسی بلند شدن: *[تعریض]* سەر کەسێ جووڵیان؛ قەبووڵ نەکردنی ئەم بار و دۆخە و

له دووی گۆڕینی کەوتن.

**زیر سر کسی بودن:** */مجازی/* لـە ژێـر سـەری کەسێکدا بـوون؛ زەدەی دەس کەسـێ بـوون ‹این دعواها همەاش زیر سر آرام بود که خـواهرش را تحریک می‌کـرد: ئـەم سـواژانە هـەمووی لـە ژێـر سەری ئارامدا بوو کە خوشکی هەڵدەخڕاند›.

**زیر سر گذاشتن:** نانەوە؛ نیانەوە؛ نانە ژێر سـەر؛ دابین‌کردن؛ زووتر ئامـادە و تـەیارکردن ‹اول پس‌اندازی زیر سرت بگذار، بعد برو زن بگیر: سـەرەتا شتێ بنەوە جا بچۆ ژن بخوازە›.

**زیر سؤال بردن:** دانە بەر باس و خواست؛ دانە بـەر لـێ‌پرسـینەوە؛ خـستنە ژێـر پرسـینەوە؛ شک‌کردن و خستنە بەر گومان و پرسـینەوە. هەروەها: **زیر سؤال رفتن؛ زیر سؤال قرار دادن**

**زیر قول خود زدن:** بڕیاری خۆ ژێر پێ نان؛ لە ژێـر قـەوڵ دەرچـوون؛ لـە بەڵـێنی خـۆ ملپێچکێ‌کردن؛ بەڵێنی خـۆ بـەڕێوە نـەبردن ‹تو نباید زیر قولت بزنی: تۆ نابێ بڕیاری خۆت ژێر پێ بنی›.

**زیر کاسه نیم کاسه‌ای بودن:** */مجازی/* شـتێک لە ژێر کڵاودا بوون؛ گەڕ و گێچەڵێک لە کاردا بوون؛ لە پـشتەوەی ڕووداوێکـەوە نهێنیـەک بوون ‹معلوم شد این رفـت‌وآمـدها دلیـل دارد و زیر کاسـه نـیم کاسـه‌ای هـست: دەرکـەوت ئـەم هـاتوچۆیانـە هـەر وا نیـە و شـتێکی لـە ژێـر کڵاودایە›.

**زیر لب گفتن:** لـە ژێـر لێـوەوە وتـن؛ چێـروو لچانە واتەی؛ بە ئەسپایی و لێو بزوانی نـەرم و ئارامەوە قسەکردن.

**زیـر مهمیـز کـشیدن:** */مجازی/* خـستنە ژێـر ڕکێفەوە؛ لەغاوکردن؛ دوو لنگـە بەملـدا شـۆڕ کردنەوە؛ سەختگری‌کردن و کێشانە ژێـر ڕای خۆ ‹سارا خـانم خیلـی زود عروسـش را زیـر مهمیـز کـشید: خاتو سارا هەر زوو بووکەکەی خـستە ژێـر ڕکێفی خۆیەوە›.

**زیر نگین کسی بودن:** */مجازی/* بـە دەس کەسێکەوە بوون؛ لە دەست کەسـێکدا بـوون؛ لە ژێر دەسەڵات یان فرمانی کەسێکدا بـوون (بە تایبەت ملک و وڵات).

**از زیر چیزی در رفتن:** */مجازی/* لە ژێر کارێـک دەرچوون؛ نەچوونە ژێـر شـتێک؛ نەویـستنی شتێک و نکوولی لێکردنی.

**به زیر آوردن:** هێنانە خوارەوە؛ هاوردنە خـوار؛ کێشانە خوار؛ داگرتن؛ داهێنان؛ ئـەرەئاردەی؛ ئەرەگێرتـەی؛ ئـاردەیرە. هـەروەها: **بـە زیـر کشیدن**

**زیر-:** *پیشوند.* ژێر- ؛ چێر-: ١. بەشی پچـووکتر یان سەر بە شتێ‌تر؛ ورد ‹زیر رده: ژێر ڕادە› ٢. بن؛ لە ژێر شتێکدا ‹زیربنا: ژێر بینا› ٣. لە پـشت یـان دوای شـتێکەوە ‹زیر پوسـت: ژێر پێـست› ٤. لـە خوارترین بەشی شـتێکدا ‹زیرنویس: ژێر نـووس› ٥. بۆ کەڵک‌گرتن لە ژێـر شـتێکەوە ‹زیر پیـراهن: ژێر کراس› ٦. لە ژێر؛ لە ڕێـی ژێـرەوەی شـتێک ‹زیرچشمی: لە ژێر چاوەوە›.

**زیرآبی** /zîrābî/: *صفت.* ژێرئـاوی؛ ژێـراوی؛ پێوەندیدار بە ژێر ئاوەوە.

**زیرآبی:** *قید.* ژێرئاوی؛ ژێراوی؛ لە ژێر ئاودا.

▣ **زیرآبی رفتن:** ١. ژێرئـاوی چـوون؛ مەلەکردن لە ژێـر ئـاودا ٢. */کنایی/* خلێنـە و بلێنـە هـەبوون؛ پەنامـەکی/ لـە ژێـرەوە/ بـە دزیـەوە کـارێ‌کـردن؛ بـە نهـێنی و دوور لـە چاوی خەڵک کـارێ‌کـردن ‹گـاهی هـم بـا زن همسایه زیرآبی می‌رفت: جاروبـاریش لەگـەڵ ژنە دراوسێدا [illegible]›.

**زیرا** /zîrā/: *حرف.* */ادبی/* لـەورا؛ چـون؛ چونکـە؛ چکـۆ؛ چونکـوو؛ چنکـی؛ چـونکی؛ چونکاتـێ؛ چـوون؛ چوونکـوو؛ چوونکـەی؛ چوونکەتـەی؛ ئەری‌یە؛ ژبەرکو؛ وڵام؛ لە بەر ئـەوەی؛ نیـشانەی ڕاڤە لە بارەی هۆ یان هۆکارەوە ‹زیرا می‌ترسید برود: چونکە دەترسا بڕوا›.

**زیراب** / zîrāb ، ـها/:/اسم. سولین؛ ژێراو؛ ئاوەڕۆ؛ ڕەهەندێ لە ژێر خەزێنەی تراوەوە کە لەوێوە خالی دەکرێ.

▣ زیراب کسی را زدن:[مجازی] ئاو کردنە ژێر مالی کەسێک؛ ئاو لە ئاوەڕۆی کەسێکەوە دەرکردن؛ ژێر پای کەسێ خالی کردنەوە؛ سەندەلی لە ژێر کەسێ کێشانەوە؛ کەسێک لە پلەوپایەی داخستن و لە شوێنێک دەرکردن.

**زیراکس** / zîrāks ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. زیراکس: ١. شێوەیەک بۆ وێنەگرتن لە بەلگە ٢. هەر شتێ کە بەو جۆرە گیراوە. هەروەها: **زیراکس کردن؛ زیراکس گرفتن**

**زیراکسی**[١] / zîrāksî ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ١. [گفتاری] دامەزراوەیێ کە بە شێوەی زیراکس لە پەڕە و بەلگە وێنە دەگرن ٢. بەرپرس یان کاربەری ئەو دامەزراوە.

**زیراکسی**[٢]: صفت. زیراکسی؛ وێنەگیراو.

**زیرانداز** / zîrandāz ، ـها/:/اسم. ڕایەخ؛ ڕایاخ؛ ڕایخ؛ ژێرخەر؛ ژێرەخەر؛ ژێرڕاخەر؛ ڕاژێر؛ چێرەخەر؛ هەر شتێ کە لە تەختی شوێنێ ڕایدەخەن (وەک دۆشەک، قالی، بەڕە و...). بەرانبەر: **رواندار**

**زیرایند** / zîrāyand/:/اسم. بنەما؛ بنەمان؛ ئاستێ کە شتێ یان شتانێک لە سەریەوە جێ دەگرن یان کار دەکەن ‹خاک زیرایند بسیاری از گیاهان است: خۆل بنەمانی زۆرێ لە گیاگەلە›.

**زیربغل** / zîrbaqal/ ☜ زیرِ بغل، زیر[٣]

**زیربنا** / zîrbanā ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. ١. ژێربەنا؛ سفنک؛ ئەنازەی پانتایی مال ‹زیربنای اینجا ۶۵ متر است: ژێربەنای ئێرە ٦٥ میترە› ٢. ژێربەنا؛ زەوینێ کە خانووی لە سەر کراوەتەوە ‹نصف زمین رفته زیربنا: نیوەی زەویەکە بۆتە ژێربەنا› ٣. بناغە؛ بناخە؛ تەمەلە؛ هیم؛ خیم؛ سۆکین؛ بنەڕەت ‹اقتصاد زیربنای جامعه است: ئابوور بناغەی کۆمەلگایە›.

**زیرپاکشی** / zîr(e)pākešî/:/اسم. [مجازی] ژێر زوان چێژی؛ کار یان ڕەوتی سەر داکێشان؛ لە ژێر زمان کێشانەوە؛ قسە لێ دەرهێنان؛ هاندانی خەلک بە درکاندنی نهێنی یان زانیاری، بە فێل و تەلەکە و زمانلووسی ‹با زیرپاکشی همسایه‌ها توانست علت دعوای آنها را بفهمد: بە سەر داکێشانی دراوسێکان توانی هۆی شەڕەکەیان بزانێ›. هەروەها: **زیرپاکشی کردن**

**زیرپایی** / zîrpāyî ، ـها/:/اسم. ١. ژێرپێ؛ پایەناز؛ پایەنداز؛ ژێرڕاخەر؛ ژێرپێڕاخەر؛ قالی، مووکت، بەڕە و ... کە شوێنێکی تایبەتی پێدادەپۆشن (وەک شوێنی هاتنی کەسایەتیەکی گەورە، ڕاپلە و...) ٢. کەرەسەیەکی لێژی چێوی کە لە کاتی دانیشتن لە سەر سەندەلیەوە دەیخەنە ژێر پێ.

**زیرپله** / zîrpelle/ ☜ زیرِ پلّه، زیر[٣]

**زیرپوست** / zîrpûst/:/اسم. [زیست‌شناسی] ١. بنپێست ٢. پوک؛ ژێرپێست؛ ژێرپۆس؛ توێژێ لە خانکگەلی ژێرین و زیندووی پێست کە لە گیانەوەراندا بریتیە لە شانەی پێوەندی چەوری، ڕەگی خوێنی و لەنفی، لووی ئارەق و پیازی موو: **لاپوست**

**زیرپوش** / zîrpûš ، ـها/:/اسم. ژێرپۆش؛ بەرگێ کە لە ژێری جلوبەرگەکانی دیکەوە دەکرێتە بەر (بەتایبەت ژنانەکەی).

**زیرپیراهن** / zîrpîrāhan ، ـها/:/اسم. ژێرکراسی؛ ژێرکراس؛ چێرگجی؛ گریڤان؛ گریوان؛ دفلوک؛ فانیلە؛ کەنزە؛ کراسئاسایەک کە لە ژێر جلوبەرگیترەوە دەیکەنە بەر (بەتایبەت پیاوانەکەی): **زیرپیرهن**

**زیرپیرهن** / zîrpîrhan, zîrpîrahan/ ☜ **زیرپیراهن**

**زیرتیره** / zîrtîre ، ـها/:/اسم. [زیست‌شناسی] ژێرتیرە؛ ژێرخێزان؛ بەشێکی جیاواز لە

تیره‌یه‌ک، که پێکه‌وه پێوه‌ندیان هه‌یه.

**زیرجامه** / zîrcāme ، ـها/: اسم. [ادبی] جل‌وبه‌رگی ژێر (ژێر شواڵی، به‌تایبه‌ت پیاوانه‌که‌ی).

**زیرجلکی** / zîrcolakî/: [فارسی/ عربی] قید. [گفتاری] به دزیه‌وه؛ وه دزیکه‌و؛ بێ‌دزیه‌وه؛ به شێوه‌ی نهێنی ‹زیرجلکی پول را برد و داد به برادرش: به دزیه‌وه پاره‌که‌ی برد و دای به براکه‌ی›: **زیرجلی**. هه‌روه‌ها: **زیرجلکی/زیر جلی کار کردن**

**زیرجلی** / zîrcolî/: [فارسی/ عربی] ☜ **زیرجُلَکی**

**زیرچشمی** / zîrčešmî/ ☜ زیرچشمی نگاه کردن، **زیر**[۳]

**زیرخاکی** / zîrxākî ، ـها/: صفت. [گفتاری] ژێرخاکی؛ گه‌وری؛ به ده‌ست‌هاتوو له ژێر خاکه‌وه وه‌کوو که‌ل‌وپه‌لی که‌ونارا.

**زیرخانواده** / zîrxānevāde ، ـها/: اسم. [زیست‌شناسی] ژێرخێزان؛ ژێرتیره.

**زیردامنی** / zîrdāmanî ، ـها/: اسم. ژێرداوێن؛ بنکۆش؛ ژێرداوێنی؛ پۆشه‌نێکی وه‌ک دامان پتر له قوماشێکی ناسک‌تر و نه‌رمتر که ژنان له ژێر دامێنه‌وه له پێی ده‌که‌ن.

**زیردریایی** / zîrdaryāyî ، ـها/: اسم. نقۆک؛ نۆقار؛ ژێرده‌ریا؛ ژێرزێ؛ ژێرزریه؛ ژێرده‌ریایی؛ جۆرێ که‌شتی که ده‌توانێ به ژێرئاوادا بڕوا.

**زیردست** / zîrdast ، ـها؛ ـان/: صفت. [مجازی] ژێرده‌سه؛ ژێرده‌سته؛ ژێرده‌س؛ ژێرده‌ست؛ چێرده‌س؛ خوارده‌س؛ خوارده‌ست؛ گوێڕایه‌ڵ و شوێنکه‌وتووی که‌سێ یان که‌سانی‌تر ‹او نمی‌خواست زیردست این و آن باشد: نه‌یده‌ویست ژێرده‌سه‌ی ئه‌موئه‌و بێ›. هه‌روه‌ها: **زیردست (کسی) بودن؛ زیردست (کسی) شدن؛ زیردست کردن**

**زیردستی** / zîrdastî/: اسم. ژێرده‌ستی؛ ژێرده‌سی: ۱. پێش‌ده‌سی؛ ده‌وری ۲. په‌ڕه‌یه‌ک له چێو، فیبر یان لاستیک بۆ دانانی کاغه‌ز له سه‌ری، کاتی نووسین یان نه‌خشه کێشان ۳. [مجازی] بچووکی؛ بار و دۆخی ژێر ده‌سته بوون.

**زیرراسته** / zîr.rāste ، ـها/: اسم. [زیست‌شناسی] ژێرڕاسته؛ به‌شێکی جیاواز له ڕاسته‌یێ که پێوه‌ندی پێوه‌یه.

**زیررده** / zîr.rade ، ـها/: اسم. [زیست‌شناسی] ژێرڕیز؛ ژێرڕزن؛ به‌شێکی جیاواز له ڕیزێ که پێوه‌ندیان پێکه‌وه هه‌یه.

**زیرزار** / zîrzār/: اسم. [ادبی] میزه؛ نووزه؛ ناڵه‌ی کز و خه‌مبار.

**زیرزبانی** / zîrzabānî/ ☜ ۱. **زیرلبی** ۲. **زیرلفظی**

▣ زیر زبانی خواستن ☜ زیرلفظی خواستن، **زیرلفظی**

**زیرزبانی**: صفت. ژێرزمانی؛ ژێرزوانی؛ پێوه‌ندیدار به ئه‌ندامانی ژێری زوانه‌وه ‹عصب زیرزبانی: ده‌ماری ژێرزمانی›.

**زیرزمین** / zîrzamîn ، ـها/: اسم. ژێرخان؛ ژێرزه‌مینی؛ ژێرزه‌وی؛ ژێرزه‌وین؛ چێرزه‌مین؛ زاخۆن؛ وارنشین؛ ناویس؛ سه‌یزان؛ ماران؛ سارداو؛ هۆده یان شوێنێ له ماڵ که که‌وتۆته خواره‌وه‌ی ڕووبه‌ری زه‌وین.

**زیرزمینی** / zîrzamînî/: صفت. ۱. ژێر زه‌وینی؛ هه‌ڵکه‌وته له ژێرزه‌ویدا ‹آبهای زیرزمینی: ئاوی ژێر زه‌ویی› ۲. [مجازی] نهێنی؛ په‌نامه‌کی؛ شاردراو؛ نادیار ‹فعالیت زیرزمینی: چالاکی نهێنی›.

**زیرزیرکی** / zîrzîrakî/: قید. [گفتاری] به دزیه‌وه؛ وه دزیه‌و؛ بێ‌دزی؛ به نهێنی؛ نهێنیانه ‹زیرزیرکی به انبار دستبرد می‌زد: به دزیه‌وه له هه‌مار دزی ده‌کرد›.

**زیرساخت** / zîrsāxt ، ـها/: اسم. بنه‌ڕه‌ت؛ بنه‌ما؛ شه‌نگسته.

**زیرسازی** / zîrsāzî ، ـها/: اسم. ژێرسازی؛ کار یان ڕه‌وتی ڕێک‌وپێک و به‌رهه‌ڤ‌کرنی ئاستێک

(وەکوو ئاستی ڕێگە یان هێڵی ئاسن) بۆ کارگەلی دوایی (وەکوو قیرڕێژی، ڕەیل داخستن و...).

**زیرسری** / zîrsarî، ـها/: اسم. [معماری] ژێرسەری؛ چوواردار؛ تیکە یان ماکێکی ساختمانی لە درێژایی سەر دیواردا کە هێز و قورسایی تیر و میچ دەکەوێتە سەری.

**زیرسیگاری** / zîrsîgārî، ـها/: [فارسی/ فرانسوی] اسم. ئادیدانک؛ خولیدانک؛ خولیدان؛ ژێرجغارە؛ ژێرجگەرە؛ تەپڵەک؛ ژێرسیگاری؛ ژێرسگار؛ چێرجگەرە؛ دەفرێکی (زۆرتر)چووکەڵە بۆ جێی سووتکەی جگەرە.

**زیرشاخە** / zîršāxe، ـها/: اسم. [زیست‌شناسی] ژێرلەق؛ بەشێکی جیاواز لە لەقێک کە پێکەوە پێوەندیان هەبێ.

**زیرشلواری** / zîršalvārî، ـها/: اسم. پاوەرە؛ دەرپێ؛ توونکە؛ تنکە؛ ژێرشواڵی؛ ژێرپاتۆڵ؛ چێرپاتۆڵی؛ جۆرێک شەرواڵی (زۆرتر) کورت لە قوماشێکی نەرم و ناسک‌تر کە لە ژێر شەرواڵەوە لە پێی دەکەن (پتر پیاوانە).

**زیرشیروانی** / zîršîrvānî، ـها/: اسم. ژێرشیروانی؛ بۆشاییەک لە نێوان سرمیچ و شیروانی ماڵێکدا کە دەکرێ وەک هەمار، یان بە تۆزێ دەستلێدانەوە ببێتە جێی دانیشتن.

**زیرفون** / zîrfûn، ـها/: [یونانی] اسم. زیرفوون؛ زیزفوون؛ جۆرێ گیای ڕازێنەیی بە شێوەی دار، دەوەن، بنچک یان گژ و گیا بە گەڵای ناوەناوە، گوڵی مرێس و بەری وشکەوە کە بۆ چەن مەبەستی جۆراوجۆر بە کار دەچێ: **زیزفون؛ نمدار**

**زیرک** / zîrak، ـها؛ ـان/: صفت. زیرەک؛ زرینگ: ١. چالاک؛ چەلەنگ؛ تروسک؛ بە دەست و برد؛ چوست؛ زیخ ٢. وریا؛ دەگەڵ؛ زیتەڵ؛ زیکل.

**زیرکانە** / zîrakāne/: قید. زیرەکانە؛ بە چالاکی؛ چالاکانە؛ چەلەنگانە؛ بە زرنگی؛ ژیرانە؛ بە دەست و برد؛ هاوڕێ لەگەڵ لێهاتوویی و وریاییدا.

**زیرکونیوم** / zîrkon(i)yom/: [فرانسوی] اسم. ماکی کیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٤٠ و کێشی ئەتومی ٩٢، بە ڕەنگی زیو، لە ئەسیددا ناتوێتەوە و ژەنگ لێی نادا و لە زۆر کاری پیشەسازیدا بە کار دەڕوا.

**زیرکی** / zîrakî، ـها/: اسم. چالاکی؛ زیرەکی؛ زرینگی؛ بار یان دۆخی زیرەک بوون.

**زیرگاه** / zîrgāh، ـها/: اسم. [نامتداول] لە سەر نیش؛ هەر یەکە لەو کەلوپەلانە کە بۆ دانیشتن بە کار دێن (وەکوو چوارپێ، سەندەڵی و موبل).

**زیرگذر** / zîrgozar، ـها/: اسم. ژێرڕا؛ ژێرگوزەر؛ ژێربگار؛ ژێربوار؛ نەغمە؛ بوارێک خوارتر لە ئاستی زەوی یان لە ژێر بوارێکی دیکەوە.

**زیرگونە** / zîrgûne، ـها/: اسم. [زیست‌شناسی] ژێرجۆر؛ بەشێکی جیاواز لە جۆرێک کە پێکەوە پێوەندیان هەیە.

**زیرلبی** / zîrlabî/: قید. [کنایی] بە سرتە؛ بە سرکە؛ لە ژێر لێوەوە؛ پتاپت؛ بە چپە؛ بە چڤە؛ چێرووڵچانە؛ لە بەرخۆوە؛ بە ئەسپایی و ڕانەگەیندراو وتن ‹زیرلبی چیزهایی گفت کە درست نفهمیدم: بە سرتە شتانێکی وت کە باش تێنەگەیشتم›: **زیرزبانی**

**زیرلفظی** / zîrlafzî، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. شەرمەوانە؛ دیارییەک کە زاوا پاش مارە برین بە بووکی دەدا بۆ شکاندنی شەرمی قسەکردن: **زیرزبانی**

▣ **زیرلفظی خواستن**: [تعریض] شەرمەوانە گەرەک بوون/ ویستن؛ لە قسەکردن خۆ پاراستن؛ بە ئەنقەست قسە نەکردن ‹انگار زیرلفظی می‌خواهی؟: چما شەرمەوانەت گەرەکە؟›: **زیرزبانی خواستن**

**زیرنویس** / zîrnevîs، ـها/: اسم. ١. پەراوێز؛ یادداشتێک لە لای خوارەوەی لاپەڕە یان

ئاخری نووسراوەیەکدا، بۆ ڕوون کردنەوە یان تەواوکردنی مەبەست ۲. ژێرنووس؛ ژێرنڤیس؛ نووسراوەیەک لە ژێر فیلمەوە کە بریتیە لە وەرگێڕانی ئاخافتنی هونەرپیشەکان.

**زیر و رو** / zîr-o-rû/: *صفت.* ژێرەوژوور؛ ژێر و ژوور؛ ژێر و ڕوو؛ دێواندیو؛ دێواندێو؛ دیواودیو؛ دێواودێو؛ دیوە و دیو؛ چەقلە و بان: ۱. ژێر و بان؛ ئەمدیو- ئەودیو؛ هەڵگێڕ- وەرگێڕ؛ هەڵگێڕ؛ هەڵگێڕ- وەڵگێڕ؛ نامژمەڵ و بێ‌ڕێک‌وپێکی ‹این‌قدر آن کتابها را زیر و رو نکن: هێندە ئەو کتێبانە دیواندیو مەکە› ۲. *[مجازی]* هەڵگێڕ- وەرگێڕ؛ هەڵگێڕ؛ هەڵگێڕ- وەڵگێڕ؛ ئاڵۆز؛ پەرێشان؛ پەشێو؛ شێواو ‹آن حادثه مادرم را بە کلی زیر و رو کرد: ئەو کارەساتە دایکمی تەواو دیواندیو کرد› ۳. *[مجازی]* ژێر و بان؛ کاول؛ وێران؛ خاپوور؛ خراو ‹خانه زیر و رو شده بود: ماڵەکە ژێر و بان کرابوو›.

▣ **زیر و رو کردن**: هەڵگێڕ- وەرگێڕکردن؛ دیواندیوکردن؛ هەڵگێڕ- وەڵگێڕکردن؛ ژێر و ڕووکردن؛ هەڵگەڕاندنەوە؛ هەڵگەڕاننەوە؛ وەڵۆدیم‌کەردەی؛ هەڵگێڕاندنەوە؛ هەڵگێڕان؛ هۆرەوە وێڵنەی.

**زیر و زبر** [1] / zîr-o-zabar/: *اسم.* سەر و ژێر؛ ژێر و سەرە؛ سەرەوژێرە؛ مووفرک؛ نیشانەی جوولەی پیت لە زمانی عەرەبی و فارسیدا.

**زیر و زبر** [2]: *صفت.* *[مجازی]* سەر و ژێر؛ ژێر و ژوور؛ سەرنخوون؛ سەر بەرەو ژێر؛ بان و خوار؛ قلپ؛ قەلب؛ قولب؛ وەلەودیم؛ هەڵەوگەڕاو؛ هەڵەوگەڕیاو؛ وێران؛ کاول ‹شهر بر اثر بمباران زیر و زبر شد: شار بە هۆی بومبارانەوە سەر و ژێر بوو›.

**زیره** / zîre ، ـها/: *اسم.* ۱. ژێرە؛ چێرە؛ بەشێک لە کەوش بریتی لە پاژنە و تەختەکەی کە دەلکێ بە ڕووەکەیەوە ۲. ژێر؛ خوار؛ بەش یان ڕووپەری ژێرین ✻ بەرانبەر: **رویه** ۳. زیرە؛ ژیرە؛ زیرن؛ کومین؛ گیایەکی ئالیکی پایا، بێ‌کولک، بە ڕیشووی هەڵمساو، لاسکی ڕێک، گەڵای ناسک و باریک، گوڵی سپی و گۆپکەی چەترئاساوە ٤. زیرە؛ ژیرە؛ زیرن؛ کومین؛ بەری ئەو گیایە کە چووکە و ڕەنگی قاوەیی ئاماڵ زەرد، سەوز و ڕەشە و بۆنخۆشە و وەک بەهارات بە کار دەڕوا.

▣ زیره به کرمان بردن: *[کنایی]* هەڵووچە بۆ نایسەر بردن؛ ماسی فێرە مەلە کردن؛ یەخ پەی شاهۆ(ی) بەردەی؛ بردنی شتێک بۆ جێگایەک کە ئەو شتە لەوێدا بە فراوانی هەبێ ‹از آلمان برایمان قالی می آوری؟ این را می‌گویند زیره به کرمان بردن!: لە ئاڵمانەوە قالیمان بۆ تێری؟ بەمە ئێژن هەڵووچە بۆ نایسەر بردن!›.

**زیره‌پلو** / zîrepolow, -polo/: *اسم.* زیرەپلاو؛ جۆرێ پلاو، کە زیرە و گۆشتی تێ‌کراوە.

**زیری** [1] / zîrî ، ـها/: *اسم.* زیقی؛ زیلی؛ زیلی؛ زیکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی زیق بوون ‹زیری صدا: زیقی دەنگ›.

**زیری** [2]: *صفت.* *[گفتاری]* ژێرین؛ ژێرگین؛ ژێرگ؛ ژێرە؛ ژێرنگ؛ خوارگین؛ چێرین ‹بشقاب زیری: دەوری ژێرین›.

**زیری** [3]: *ضمیر.* ژێرین؛ ژێرنگ؛ چێرین؛ خوارین؛ ئەوی لە ژێردا ‹زیری را بده: ژێرینەکە بە›.

**زیرین** / zîrîn/: *صفت.* *[ادبی]* ژێرین؛ ژێروو؛ ژێرگ؛ ژێرە؛ ژێرگین؛ چێرین؛ ئەوی لە ژێرەوەیە.

**زیزفون** / zîzfûn/: [یونانی] ☜ **زیرفون**

**زیست** [1] / zîst/: *اسم.* ژی؛ ژیوار؛ ژیواری؛ زیوار؛ نسک؛ جیو؛ ژیو؛ کار یان ڕەوتی ژیان؛ ژین؛ زیندەگی‌کردن ‹شرایط زیست: هەلومەرجی ژین›.

**زیست ـ** [2]: *پیشواژه.* ژی‌ـ: ۱. ژیان؛ گوزەران؛ زینگی؛ ژیوار ۲. گیاندار؛ گیانلەبەر.

**زیستبوم** / zîstbûm/: *اسم.* ژینگە؛ جێ‌ژین؛ جێگە و شوێنی ژیان.

**زیست‌سنجی** / zîstsancî/: *اسم.* ژین‌پێوی؛

ژیـن‌سـەنگێنی؛ پێـدا چوونـەوە، لێکدانـەوە و توێژینەوەی ژمێرکـۆیی بینـراوە و دیاردەگـەلی سەر بە گیانەوەرانەوە.

زیــستشــناس / zîstšenās ، ـهـا؛ ـان/:اسم. ژین‌ناس؛ ژیناس؛ ژیزان؛ ئەو کەسەی کە کـاری توێژینەوەی زانستی سەبارەت بە گیانـەوەران و کار و ڕەوتی ژیانیانە.

زیستشناسی / zîstšenāsî/:اسم. ژیـن‌ناسـی؛ ژیناسـی؛ ژیـزانی؛ زینەوەرناسـی؛ ژیـان‌ناسـی؛ زانستی ناسین، ڕیزبەندی و لێکۆڵینەوەی ژیانی گیانەوەران.

زیستشیمی / zîstšîmî/: [فارسی/ فرانسوی]/اسم. ژی‌شیمی؛ بیووشیمی؛ شیمی گیانداران.

زیستفیزیک / zîstfîzîk/: [فارسی/ فرانسوی]/اسم. ژی‌فیزیک؛ بیووفیزیک؛ فیزیکی گیانداران.

زیــستکرد / zîstkore/: [فارســی/ عربــی]/اســم. ۱. بەشـێک لـە جیهـان کـە ژیـانی تێدایـە ۲. سەرجەمی گیانداران و شـوێن و مەڵـبەندی ژیانیان.

زیستگاه / zîstgāh ، ـها/:اسم. ژینگـە؛ مەڵـبەند؛ مەڵـبەن؛ مەڵـوەن؛ هێـفر؛ زینـوی؛ ژینــەوار؛ جێگەی ژیان، بەتایبـەت ئاقـاری سروشـتی لـە دایک بـوون و سـانەوەی گیانـەوەران ‹کوههـای شـاهو زیـستگاه آهـوی خالـدار اسـت: کێـوی شـاهۆ مەڵـبەندی ئاسکی خاڵدارە›.

▣ زیــستگاه ییلاقــی: هــەوار؛ هەوارگــە؛ وارگــە؛ جێگەی ژیانی هاوینی.

زیــستمحیطــی / zîstmohîtî/: [فارســی/ عربــی] صفت. ژینگەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ژینگەی گیانداران.

زیــستمند / zîstmand ، ـان/:اســم. ئەنـداموەر؛ ژینەوەر؛ بوونەوەرێ کە بۆ کارگـەلی جۆراوجـۆر ئەندامی تایبەتی هەیە و ئـەم ئەندامانـە پێکـەوە کار دەکەن.

زیستن / zîstan/: مـصدر. لازم. [ادبـی] // زیــستی: ژیـای؛ میزیی: دەژی؛ بزی: بـژی // ژیـان؛ ژیـاین؛ ژیوەی؛ ژیوای؛ یاشـتن؛ ژیـن؛ زینـدەگی‌کـردن ‹خوب زیستن: چاک ژیان›. هەروەها: **زیستنی**

■ صـفت مفعـولی: **زیـسته** (ژیـاو)/ مـصدر منفـی: **نزیستن** (نەژیان)

**زیستی** / zîstî/: *صفت.* ژیانی؛ ژینی؛ پێوەندیـدار یان سەر بە ژینەوە.

**زیگزاگ** / zîgzāg ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. زیگزاگ؛ لابەلا؛ لاپلا؛ لارە؛ لاوەلا؛ خلێوخـاو؛ گامێزڕێگـە؛ ڕێگە یان هێڵێکی نارێکی ددانـەداری لـە دووی یـەک (لـە بیچمـی حـەوت و هەشـت): **زیگــزال** *[گفتاری]*

▣ زیگــزاگ رفــتن: لابــەلا ڕۆیــشتن؛ لارەلار ڕۆیین؛ پێچەڵپێچ لێدان؛ بە شێوەی نارێـک و خوار و خێچ چوون.

**زیگـــزاگدوزی** / zîgzāgdûzî ، ـهـــا/: [فرانــسوی/ فارســی]/اســم. زیگــزاگ‌دووری؛ جــۆرێ دروومــانی ڕازێنــەیی بــە شــێوەی ددانەگـەلی لـە شـوێن یـەک: **زیگــزال‌دوزی** *[گفتاری]*. هەروەها: **زیگزاگ‌دوز**

**زیگزال** / zîgzāl/: [فرانسوی] ☜ **زیگزاگ**

**زیگـــزال‌دوزی** / zîgzāldûzî/: [از فرانــسوی/ فارسی] ☜ **زیگزاگ‌دوزی**

**زیگما** / zîgmā/: [؟] ☜ **سیگما**

**زیگـوت** / zîgot ، ـهـا/: [؟]/اسم. *[زیست‌شناسی]* زیگـوت؛ تـۆوی بـاروەربوو بـەر لـە دەسـپێکی دابەشی.

**زیگورات** / zîgûrāt ، ـها/: [انگلیسی از اکدی]/اسم. زیگوورات؛ جۆرێ خانووبەرەی کـەونارای چەنـد نهۆمی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کە بە شـێوەی هیرەمی چوارسووچ و پلە‌پلەیە.

**زیلـــو** / zîlû ، ـهـا/:اسـم. زیلـۆ؛ بـەڕ؛ بـەڕە؛ ژێڕاخەری دەستچن لە بەنی پەمووییی ئەستوور و بە نەخشگەلی وەک نەخشی جاجم.

**زیلوفن** / zîlofon/: [؟] ☜ **کِسیلُوفُن**

**زیـــن** / zîn ، ـهـا/: اسم. زیـن؛ مارەکـە: ١. کەرەستەیەکی چەرمی وەک پاڵشتێکی نێو چاڵ، بە تەنگە و مامزەوە، کە لە کـاتی سـواریدا دەیخەنـە سـەر پـشتی ئەسـپ و بـە سـەریەوە دادەنیـشن ٢. جێگـەی دانیـشتن لـە سـەر دووچەرخە یان موتور.

◻ **زین کردن**: ١. زیـن کـردن؛ تەنگـدان؛ زیـن بەسـتن بـە پـشتی ئەسـپەوە ٢. *[کنـایی]* گورجەوە بوون؛ ئامادە بوون؛ گیڤ بوون؛ تەیار بوون بۆ ڕۆیشتن بۆ شوێنێک ‹آزاد هم زین کرده بـود همـراه مـا بیایـد: ئـازادیش گورجـەوە ببـوو، لەگەڵمان بێ›.

**زیـن‌افـزار** / zînafzār ، ـهـا/: اسم. ١. زیـن و بەرگ؛ زین و تاقمزین؛ کەڵوپەلی زین ٢. *[ادبی]* چەک؛ چەک و ڕەخت.

**زیـن‌پـوش** / zînpûš ، ـهـا/: اسم. زیـن‌پۆش؛ سەرزین؛ پارچەیەک کە بە سەر زیندا دەگیرێ.

**زینــت** / zînat ، ـهـا/: [عربـی]/اسم. ڕازێنـە: ١. ڕەوش؛ خـشڵ؛ زەمبـەر؛ خـەمڵ؛ خـەمڵ؛ خەوش؛ ئـەو شـتەی کـە بـۆ جوانترکردنـەوەی شتێکی دیکە دەچێتە کار، وەکوو زێڕ و زەنبـەر ‹خانـەشـان هـیچ زینـتی نداشـت: ماڵـەکەیان هـیچ ڕەوشێکی نەبوو› ٢. ئەو شتەی کە دەبێتە هـۆی ڕازاندنەوە ‹عروس هیچ زینتی نداشت: بـووک هـیچ ڕازێنەیەکی نەبوو›.

◻ **زینـت یـافتن**: زەیـنین؛ زەییـنین؛ ڕازانـەوە؛ خەملین؛ خەملان؛ ئەوەڕازیەی.

**زینـت‌آلات** / zînatālāt/: [عربـی]/اسم. خـشڵ؛ زەنبـەر: ١. سـەرجەمی ئـەو شـتانەی کـە بـۆ ڕازاندنەوەی کەس یان شوێنێک بە کـار دەچـن ٢. زێڕ و زەمبەر؛ زیوەر.

**زینت‌بخش** / zînatbaxš/: [عربی/ فارسی] *صفت*. ڕازێنەر؛ جـوان‌کـەرەوە؛ بـە تایبەتمەنـدی یـان توانایی ڕازاندنـەوە و جـوان‌کـردنی کـەس یـان شتێکەوە. **زینت‌افزا**

**زینتــی** / zînatî/: [عربـی] *صـفت*. ڕازێنـەیی؛ بەتایبەتمەندی بە کار چوون وەک خشڵ ‹کالای زینتی: کالای ڕازێـ›.

**زیـن‌سـاز** / zînsāz ، ـها؛ ـان/: اسم. زینـدوور؛ زینـدروو؛ زینـساز؛ ئـەو کەسـەی کـە کـاری دروست‌کردنی زینی ئەسپە.

**زینـک** / zînk ، ـهـا/: [انگلیـسی از آلمـانی]/اسم. زینـک؛ پلـەت؛ پـەڕەی کـانزایی، زۆرتـر لـە جنسی ڕۆح، کـە لـە چـاپی ئۆفـسیتدا بـە کـار دەچێ.

◻ **زینک مـسی**: زینـک/ پلـەتی مـسی؛ پـەڕەی کانزایی لە ئالیاژی مس کە بـەدەوامتـرە و بـۆ چاپ لە ژمارەی زۆردا بە کار دێ.

**زیـن‌کوهـه** / zînkûhe ، ـهـا/: اسم. *[قـدیمی]* سەمەرە؛ سنگەی پاش یان پێشەوەی زین.

**زین‌وبـرگ** / zîn-o-barg ، ـهـا/: اسم. *[قـدیمی]* زیـن و بـەرگ؛ زیـن و تـاقمزیـن؛ کـەڵوپـەلی تایبەت بۆ شەڕڤانی سوار.

**زینـــه** / zîne ، ـهـا/: اسم. پلـە: ١. پلـەک؛ دەرەجـە ٢. *[قـدیمی]* پـێ‌پیلکـە؛ پلیکـان؛ پلەکانـە؛ پلـەکان ٣. نـەردیوان؛ نـەردەوان؛ پەیژە؛ پەینجە؛ پاپەینجە.

**زینهار** / zînhār/ ☜ **زنهار**

**زیور** / zîvar ، ـها: [سغدی]/اسم. خشڵ؛ خـەمڵ؛ خشر؛ خەوش؛ زەنبەر؛ زەمبەر؛ تیتـک (خشڵی ناوچاوان)؛ تیتە؛ زەردینە؛ ڕەوش ‹علم زیور انسان است: زانین خشڵی مرۆیە›.

**زیــورآلات** / zîvarālāt/: [سـغدی/ عربـی]/اسم. سلسـلەوپلپـلە؛ خـشڵ و زەنبــەر؛ زەمبــەر؛ خـــشروخاڵ؛ چـــەک؛ چـــەک و خـــشڵان؛ و شتانەی کـە بـۆ خەمڵانـدن و جـوان بـوون بـە خۆیـدا دەکـەن (وەکـوو خرخـاڵ، ملوانکـە، ئەنگوستیلە، بازنە و ...).

**ـ زیوی** / zîvî/: *پیواژە*. ـ ژیوی؛ ـ نسکی؛ ـ جیوی؛ ـ ژیواری؛ ژیان؛ ژین.

# ژ

ژ / j/: حـرف. ژ؛ نیـشانەی پـیتی چواردەهــەمی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.
ژ / je/: اسـم. ژێ؛ نـاوی چواردەهــەمین پــیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.
ژاژ / jāj، ـها/: اسم. [ادبی] ۱. گاکۆتـەڵ؛ کۆتـەڵ؛ کۆزر؛ کۆزەر؛ کوێزر؛ چەت؛ هەرکام لە گیاگەلی خۆرسک و درکاوی سارا کە بۆ سـووتان دەشـێ ۲. [مجازی] چەلــتە؛ گــەزاف؛ شـاتە؛ مـزەمـز؛ ڕیوەڕیو؛ قسەی قۆڕ؛ وتەی بێهۆ و لابەلا.
▣ ژاژ خاییـدن: [ادبـی، کنـایی] ژاوەژاو کــردن؛ لاژەلاژ کردن؛ کـاوێژ کـردن؛ مزەمـز کـردن؛ ڕیوەڕیو کردن؛ قسەی بـێ کەڵـک وتـن، یـان چەندپاتە کردنەوەی قسەیەک.
ژاژخائی / jājxā'î/ ☜ ژاژخایی
ژاژخـایی / jājxāyî، ـها/: اسم. [ادبی، کنـایی] ڕیوەڕیـو؛ هــەرزەگۆیی؛ لاژەلاژ؛ ژاوەژاو؛ درێــژ دادڕی؛ چەنـد پاتەکردنـەوەی قـسەی بـێتـام: ژاژدرایی؛ ژاژخائی. هەروەها: ژاژخا
ژاژدرایی / jājdarāyî/ ☜ ژاژخایی
ژاغــر / jāqar/: اسـم. چیکــڵدان؛ جیقــڵدان؛ زیقەتۆرە؛ سیقەتۆرە؛ سـیکەتۆرە؛ جـێ دەنـک و دانە لە ژێر مل و سەرسینەی پەلەوەران.
ژاکــارد / jākārd/: [فرانـسوی] اسـم. ژاکــارد: ۱. کەرستەیەک لە سـەر ماشـێنی جـۆلایی بـۆ نەخشدارکردنی پارچە.
ژاکت / jākat, jāket، ـها/: [فرانسوی از انگلیسی] اسم. جاکەت؛ چاکەت؛ کۆتی چنراو لە کاموا.
ژالاب / jālāb/: [فرانسوی] ☜ ژالاپ
ژالاپ / jālāp، ـهـا/: [فرانـسوی] اسـم. گیایـێ پــەلکوت، بــە دوو جــۆر ڕیــشووی ناســک و هەڵماسـیو، سـەلکی گـەڵای سـەوزی ڕۆشـنی بێددانەی وەک دڵ، گوڵی شەیپوورئاسا و بـەری خــڕەوە، لــە ڕیــشووە هەڵماسـیوەکەی دەوای ڕەوانکەر دروست دەکرێ: جالاب؛ جَلَب؛ ژالاب
ژاله / jāle، ـها/: [سنسکریت] اسم. [ادبی] شـەونم؛ شەڤنم؛ ئاونگ؛ ئاڵشت؛ ئاڵشتە. ☜ شبنم
ژامبــون / jāmbon/: [فرانـسوی] اسـم. ژامبـۆن؛ گۆشتی ڕان بەتایبەت گۆشـتی ڕانی بـەراز، گـا یـان مریـشک کـە لـە کارخانـەدا بەسـەبەندی دەکـرێ وەک باسـترمە دەپێچرێتـەوە و جـۆرە خواردنێکە.
ژانــت / jānet/: [؟] اسـم. ژانیــت؛ دەســک؛ ئامرازێک بۆ ئوتووکردنی قـۆڵ، وەکـوو سـەرین وایە و لە نێو قۆڵدا جێدەگرێ.
ژانـدارم / jāndārm، ـها؛ ـان/: [فرانسوی] اسم. جەندرمە؛ جاندارم؛ قۆڵچی؛ پۆلیسی ڕێگاوبـان و دەور و بەری شار.
ژانــدارمری / jāndārmerî/: [فرانـسوی] اسـم.

ژانـــدارمیری؛ ڕێخراوەیـــەکی دەوڵـــەتی کـــە بەڕێوەبردنی نەزم و قانوونی دەرەوەی شاری بە ئەستۆوە.

**ژانر** / jānr/: [فرانسوی]/اسم. ژانر؛ شێواز؛ چەشن و چـەمکێکی تایبـەت لـە ئاسـەواری وێژەیـی و هونەریدا.

**ژانویــە** / jānvîye/: [فرانـسوی]/اسـم. ژانویـە؛ کانوونی دووهەم؛ مانگی هەوەڵی ساڵی زایـینی کــە ٣١ ڕۆژە و لـــە ١١ی بــەفرانبارەوە دەس پێ‌دەکات.

**ژاول** / jāvel/: [فرانسوی] ☜ آب ژاول، **آب**

**ژئوپلیتیـــک** / je'opolîtîk/: [فرانـــسوی]/اســم. ژیئۆپولیتیک: ١. تێکەڵاویـەک لـە هۆکارگـەلی جوگرافیایی و ڕامیاری ٢. جوگرافیای سیاسی.

**ژئوتاکتیـــسم** / je'otāktîsm/: [فرانـــسوی]/اســم. ژیئۆتاکتیسم؛ جمە و جووڵـە بـە هـۆی هێـزی ڕاکێشەری زەویەوە: **ژئوتاکسی**

**ژئوتاکـــــسی** / je'otāksî/: [فرانـــــسوی] ☜ **ژئوتاکتیسم**

**ژئوتروپیسم** / je'ot(e)ropîsm/: [فرانـسوی]/اسـم. *[زیـــستشناســـی]* زەویخـــوازی؛ زەویـــوازی؛ زەویەوگری؛ ڕەوتی ڕوان یـا لارەو بـوون بـەرەو زەوی بەتایبەت لە گیادا.

**ژئودزی** / je'odezî/: [فرانسوی]/اسم. زەوی‌پێوی؛ تۆژینەوە لە بیچمی زەوین و دۆزینەوەی هەموو شوێنێکی سەر زەوی.

**ژئوشـــــیمی** / je'ošîmî/: [فرانـــسوی]/اســـم. زەوی‌شیمی؛ زانستێ کە باس لە تێـک‌ئـالاوان و گۆڕانکاری کیمیایی بـەشـی سـفت و گرتـووی زەوین و گۆکانی‌تر دەکا.

**ژئوفیزیـــــک** / je'ofîzîk/: [فرانـــسوی]/اســـم. زەوی‌فیزیک؛ زانستێ کە لە ماکی زەوین، وەک هـەوا، ئـاو، بوومەلـەرزە، گـرکان، شـوێنەواری میگناتیسی و ڕادیۆئەکتیڤ دەکۆڵێتەوە.

**ژئومرفولژی** / je'omorfolojî/: [فرانـسوی]/اسم. لەقێ لە زەویزانی کـە لـە سـەر زۆپـی، چاڵـی، ئاوەکان و بەژگەلی زەوین و هـۆی بـەدیهاتنیان دەکۆڵێتەوە.

**ژپـــن** / jepon ، ـهـا/: [از فرانـسوی]/اسـم. ژیپـۆن؛ کوڵەنەوار؛ کوڵەداوێنێک کە بۆ پـف تێچـوون و بەرزەوە بـوونی داوێـن، لـە ژێـرەوە دەیپۆشـن: **ژیپێن**

**ژتون** / jeton ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ژیتون؛ ئاسن، پلاستیک یان کاغـەزێک کـە لـە دان و سـتانی ناوخۆیی شوێنێکدا (وەک: چێشتخانە، قومارخانـە و...) بایی برێ پارەیە.

**ژ.ث.** / je.se. ، ـهـا/: [؟]/اسـم. ژێ.سـێ؛ نـاوی بازرگانی جۆرێ چەکی خۆمەش.

**ژرژت** / jorjet/: [فرانسوی]/اسم. ژورژێت؛ جۆرێک پارچەی ناسکی وردچن، کە ڕووەکەی هێندێک زبرە.

**ژرسه** / jerse/: [فرانسوی]/اسم. ژێرسێ؛ جەرسـە؛ پارچەیەکی کێشبافی سادەیە کە لە بەن چنراوە و زۆرتـر بـۆ بـەرگی ژنانـە، گنجـی وەرزشـی و ژێرپۆش بە کاری دەبەن.

**ژرف** / jarf/: *صـفت. [ادبـی]* قـوول: ١. نـووق؛ نق؛ کووڕ؛ کـوور؛ کـوویر؛ قیـل؛ گـاود؛ سـووتار؛ سـاکوول؛ سـاکوڵ؛ سـووتاڵ؛ بـاهوو؛ بـە درێژایـی زۆرەوە بـۆ لای خـواروو ‹دریـای ژرف: زەریـــای قـــوول› ٢. دژوار لـــەباری تێگەیـشتنەوە ‹مفهـوم ژرف: مانـای قـوول› ٣. درێـژ؛ بـە مەودایـەکی زۆر لـە ڕاسـتانیدا ‹غـار ژرف: ئەشـکەوتی قـوول› ٤. بـە پێـز، هێـز یـان پێـشینەیەکی زۆرەوە ‹انـدوه ژرف: خـەمی قوول›.

**ژرفا** / jarfā/: اسم. قووڵایی؛ کـووراهی؛ کـورایی؛ قووڵی؛ ناخ؛ کـووڕی؛ بـار یـان چۆنیـەتی قـووڵ بوون.

**ژرفاسنج** / jarfāsanc ، ـهـا/: اسـم. قـووڵایی‌پێـو؛ ئامێرێک بـۆ پێـوانی قـووڵایی زۆر بـە یارمـەتی

خێرایی دەنگ لە ئاودا. هەروەها: **ژرفاسنجی**

**ژرفاندیش** / jarfandîš ، ـان/: صفت. وردبین: ١. بیرمەند؛ خاوەن توانایی بیرکردنەوە بە وردی ٢. وردابین؛ خاوەن هۆگرەتی بە چالاکی بیرکردنەوەی لە سەر یەک و بێپسان.

**ژرفاندیشی** / jarfandîšî/: اسم. وردبینی؛ چۆنیەتی وردبین بوون.

**ژرفبین** / jarfbîn ، ـان/: صفت. [ادبی] وردبین؛ خاوەن بیر و تێڕامانی ورد.

**ژرفبینی** / jarfbînî/: اسم. وردبینی؛ بە کار هێنان یان هەبوونی بیری ورد.

**ژرفزی** / jarfzî ، ـان/: صفت. [زیستشناسی] بە تایبەتمەندی یان توانایی ژیان لە قوولایی ئاودا.

**ژرفسنگ** / jarfsang/: اسم. [زمینشناسی] باتوولیت؛ پازار؛ جۆرێ بەردە کە لە توێگەلی ژێرەوەی زەویدا دروست بووە.

**ژرفش** / jarfeš/: اسم. دۆخ یان چۆنیەتی قوول بوونەوە.

**ژرفنا** / jarfnā، ـها/: اسم. [ادبی] قوولایی؛ کانگا؛ جێگای قوول.

**ژرفنگری** / jarfnegarî/: اسم. وردبینی؛ کار یان ڕەوتی ورد بوونەوەی ژیرانە. هەروەها: **ژرفنگر**

**ژرمانیم** / jermāniyom/: [فرانسوی] اسم. ژێرمانیۆم؛ توخمی کیمایی کانزاسا بە ژمارەی ئەتومی ٣٢ و کێشی ئەتومی ٧٢،٥٩وە، ڕەق و سپی ئامال خۆڵەمێشی، تێکەڵ بە ئاو نابێ و ئالیاژ پتەو دەکاتەوە و دەبێتە هۆی داشکاندنەوەی تیشک لە شیشەدا.

**ژرمن**[1] / jerman ، ـها/: [فرانسوی] اسم. ژێرمەن؛ ڕەگەزی خەڵکی ئاڵمان و زۆربەی ئوتریش و بەشێک لە خەڵکی سوویس.

**ژرمن**[2]: صفت. ژێرمەن؛ ئاڵمانی؛ سەر بە خەڵکی ئاڵمان.

**ژرمنی** / jermanî/: [فرانسوی] اسم. ژێرمەنی؛ لقێک لە زمانە هیندو-ئورووپاییەکان، (بریتی لە ئاڵمانی، ئینگلیزی، هولەندی، فەلاندری، ئافریکان و ئیسکاندیناویایی).

**ژزوئیت** / jezo'ît/ [فرانسوی] ☜ **یَسوعی**

**ژست** / jest ، ـها/: [فرانسوی] اسم. بیچم؛ بڕ و بیچم؛ ژیست؛ ملق: ١. زیوە یان دیمانی ئەندامان، بەتایبەت دەس، بالاتەنە و سەروچاو بۆ دەربڕینی مەبەستێک یان پێداگری لە سەر شتێک ‹ژست خوبی داشت: بڕوبیچمێکی باشی هەبوو› ٢. [مجازی] بزوان یان هەڵسوکەوتێک کە نیشاندەری واتا یان بڕوایەکە ‹ژست سیاسی: بیچمی رامیاری›.

◘ **ژست گرفتن**: قیافەگرتن؛ خۆ بە جۆرێکی تایبەت شاندان.

**ژستی** / jestî/: [فرانسوی] صفت. [گفتاری] خۆنوێن؛ خاوەن جم و جووڵ و دیمانێکی ڕواڵەتی بۆ خۆ نواندن.

**ژفک** / jafak/: اسم. ڕیپۆق؛ چلکی چاو.

**ژل** / jel ، ـها/: [فرانسوی] اسم. ژیل؛ هەر ماکێکی تێکەڵاوی کلۆئیدی گرساو (وەک ژیلی دەرمان و قژ و...).

**ژلاتین** / jelātîn/: [فرانسوی] اسم. ژیلاتین؛ تێکەڵاوێک لە پرۆتۆئینگەل بە شێوەی گەرد یان پەڕەگەلێکی بێڕەنگ، بێبۆن و بێتام کە بۆ بەرهەم هێنانی چەسپی کاغەز، فیلمی وێنەهەڵگری، بەستەنی و ژیلە بە کار دەڕوا.

**ژلاتینی** / jelātînî/: [فرانسوی] صفت. ژیلاتینی: ١. بە چۆنیەتی و دۆخی ژیلاتینەوە ٢. لە جنسی ژیلاتین.

**ژله** / jele/: [فرانسوی] اسم. ژیلە: ١. ژیل ٢. جۆرێ خواردەمەنی کە بە ئاومیوە و ژیلە و

شەکر چێ دەکرێ.

**ژمـول** / jemûl/: [؟]/اسم. [زیست‌شناسی]/ وەچ؛ گوە؛ خەڵفی دواییبی گیا.

**ژن** / jen، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ژێن؛ هۆکـاری ڕاگواســـتنی دانـــستەگەلی ڕەگـــەزی لـــە کرۆموزۆمدا.

▣ **ژن بارز/ غالب**: ژێنی زاڵ؛ ژێنێکـی بـەهێزتر کە تایبەتمەندی میراتی دژە خۆی دادەپۆشێ و هەلی ڕەخسانی پێنادا.

**ژن نهفته/ مغلوب**: ژێنی شاراوە/ بە زیو؛ ژێـنی لاواز کە بە ژێنێکـی بـەهێزتر دادەپۆشـرێ و هیچ شوێنێ لە خۆی جێ ناهێڵێ.

**ژنتیـــــک** / jenetîk/: [فرانـــــسوی]/اســـم. ژێنێتیـک؛ زانـستێ کـە لـە سـەر دیـاردەی میراتبـــــەری، هۆکـــــارە میراتیـــــەکان و شوێنەوایان دەکۆڵێتەوە.

**ژنتیکی** / jenetîkî/: [فرانسوی] صفت. ژێنێتیکـی؛ میراتی؛ وەراسەتی؛ ئێرسی.

**ژن‌درمـانی** / jendarmānî/: [فرانسوی/ فارسـی] /اسم. ژێن‌دەرمانی؛ دەرمانی ناسامانیگەلی میراتی (وەک تالاسمی و هێمۆفیلی) بـە دەسـت لێـدانی ژێنگەلی دیاریکراو.

**ژنـده** / jende/: صفت. [ادبی] ١. شـڕ؛ شـەکی؛ لەبەرە؛ کەڤن؛ تیتۆڵ ٢. شڕەبار؛ خەسپاڵ.

**ژنـــده‌پـــوش** / jendepûš، ـهـا؛ ـان/: صفت. [ادبـی] شـــڕەبار؛ کـــەرپاڵ؛ شـــڕ و شـــەوێڵ؛ ڕینگـاڵ؛ شـڕۆڵ؛ جـل‌شـڕ؛ تیتـەڵۆ؛ شـیڕۆڵ؛ گێتـــە؛ بـــەرگ‌شـــڕ؛ شـــڕپۆش؛ سیپالـــپۆش؛ کۆنەپۆش؛ جلک‌قەتیای.

**ژنراتـور** / jen(e)rātor، ـهـا/: [فرانـسوی]/اسـم. موتوربەرق؛ ژنراتور؛ دینەمۆ؛ زایەنەر؛ ماشینێ کە هێزی میکانیکی دەکاتە هێزی کارەبا.

**ژنرال** / jen(e)rāl، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ژنـراڵ: ١. سەرلەشـکەر ٢. تیمـسار؛ ئـەمیر؛ ئەرتـەش: **جنرال**

**ژنریـــک**[1] / jenerîk/: [فرانـــسوی] ☜ داروی ژنریک، **دارو**

**ژنریک**[2]: صفت. ١. گشتی؛ هەمووانی ٢. ژنریک؛ بەبێ ناوی بازرگانی.

**ژنـــی** / jenî/: [فرانـــسوی] صـــفت. ١. بلیمـــەت ٢. پێوەندیدار یان سەر بە ژێن.

**ژوئـــن** / jû'an/: [فرانـــسوی]/اســـم. هزیـــران؛ حوزەیران؛ مانگی شەشەمی زایـینی، ٣٠ ڕۆژە و لە ١١ی جۆزەردانەوە دەس‌پێدەکات و لـە ٩ی پووشپەڕدا دەبڕێتەوە: **جون**

**ژوئیه** / jû'îyye/: [فرانسوی]/اسم. ژوویيە؛ تەمووز؛ مانگی حەوتەمی ساڵـی زایـینی، ٣١ ڕۆژە و لـە ١٠ی پووشـپەڕەوە دەس پێـدەکات و لـە ٩ی گەلاوێژدا تەواو دەبێ: **جولای**

**ژوت** / jût/: /اسم. کەنەف؛ جـووت؛ گیایـەک لـە تیرەی تۆرکیان بە ڕیشاڵی سۆلۆلۆزی قایمەوە.

**ژوراســـیک** / jûrāsîk/: [فرانـــسوی]/اســـم. ژووراسیک؛ دووهەمین خول لە خولی دووهەمی زەوین‌ناسی کە بـە سەرهەڵـدانی دایناسـۆران و گوهانــــداران و پەلــــەوەرانی ســــەرەتایی دەناسرێتەوە.

**ژوردوزی** / jûrdûzî/: [فرانسوی/ فارسـی]/اسـم. جۆرێ درووماني بۆ ڕازاندنـەوەی پارچـە کـە لـە سـەر تاڵـکێش‌کـردنی چەنـد تاڵـی تـان و پـۆ درووس دەبێ.

**ژورنال** / jûrnāl، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ژوورنـاڵ؛ گۆڤاری تایبەتی کاردەستی و باوی ڕۆژ.

**ژورنالیـست** / jûrnālîst، ـهـا/: [فرانـسوی]/اسم. ڕۆژنامەنووس؛ ڕۆژنامەوان؛ کەسێ کە بۆ ڕۆژنامە هەواڵ دەنێرێ.

**ژورنالیـــستی** / jûrnālîstî/: [فرانـــسوی] صـــفت. ڕۆژنامـەوانی؛ ڕۆژنامـەیی ‹فعالیتهـای ژورنالیـستی: چالاکیگەلی ڕۆژنامەوانیی›.

**ژوکر** / joker، ـهـا/: [فرانـسوی از انگلیـسی]/اسـم. شەیتانە؛ جۆرێ وەرەقـی پاسـوور کـە لـە هـەر

دەستەدا دوو دانە هەیە و بە جێی هەر کام لە وەرەقەکانیتر بە کار دێ.

**ژول** / jûl/: [فرانسوی] /اسم. [فیزیک/ ژوول؛ پێوانەی کار و هێز لە کۆئەندامی میتردا.

**ژولیدگی** / jûlîdegî/: اسم. ئاڵۆزاوی؛ شپرزی؛ گــرژی؛ درژی؛ گــرژ و درژی؛ شــپرزیاگی؛ شپرێوی.

**ژولیــــدن** / jûlîdan/: مــصدر. لازم. [ادبــی] ئاڵـۆزیان؛ هاڵـۆزیان؛ ئاڵـۆزکیان؛ تێـکهـالان؛ لێکهـالان؛ هاڵـیان؛ ئاڵـیان؛ دژیـەی؛ دژیـای؛ دەژیـەی؛ شـێوان؛ شـپرزان؛ شـەمزان؛ ژلوقـان؛ ژلـێوان؛ شـیویەی؛ شـێویای؛ تێـکچـوون؛ تێکشیەی.

■ صفت مفعولی: **ژولیده** (ئاڵۆزاو)

**ژولیــده** / jûlîde/: صـفت. شـێواو؛ ئاڵـۆزاو؛ شپرزاو؛ گژن؛ گژۆلـە؛ شـپرز؛ شـپریو؛ گیـژاڵی؛ شـــلەژاو؛ شـــپرزە؛ دەژیـــا؛ دژیـــا؛ ئاڵـــۆز؛ تێکهاڵاو؛ تێکـەڵ ـپێکـەڵ ‹موی ژولیده: قـژی شیواو›.

**ـــ ژه** / je/: پسوند. [ادبی] ـــ یـژە؛ ـــ ئێکـڵە؛ ـــ ئێچکـە؛ ـ ئۆڵـە؛ـــ ئوولـە؛ ـئیجـە؛ ـئیچـە؛ ــئیژگـە؛ ـ ئەکـڵە؛ ـ ئژگـە؛ ـ ئۆکـە؛ نیـشانەی چکۆلەکردنەوە.

**ژیان** / jiyān/: صفت. [ادبی] دڕندە؛ توورە؛ ئارژی؛ گرگین؛ درژ؛ گرژ؛ ڕقهەستاو.

**ژیبــــرلین** / jîberlîn/: [؟] /اســم. ژیـــبرلین؛ جۆرە هورمـوونێکی گیاییـە کـە دەبێتـە هـۆی خێــرا گەشــکەکردن و بــەردار بــوونی گیــا: **جیبرلین**

**ژیبون** / jîbon/ [فرانسوی از انگلیسی] ☜ **گیبۆن**

**ژیـپس** / jîps/: [فرانسوی] /اسم. بـەردی گـەچ؛ گەچەبەردینە.

**ژیپن** / jîpon/ ☜ **ژپێن**

**ژیگانتیسم** / jîgāntîsm/: [فرانسوی] /اسم. [پزشکی/ جیبرمەیی؛ دۆخی زل بـوونی لـە ڕادەبـەدەری لەش، بەهۆی زۆر بوونەوەی هۆرمونی گەشە لـە لەشدا.

**ژیگلــــور** / jîglor، هــا/: [فرانــسوی] /اســم. ژیگلــور؛ لوولەیـــەکی ئاســنی پێچــدار بــۆ گەیانـدنی سـووتەمەنی لـە چاوگەیەکـەوە بـۆ شۆڵە.

**ژیگـــــو** / jîgo/: [فرانــسوی] /اســم. ژیگــۆ؛ خواردەمەنیەک لە گۆشت بەبێ ئێسقان.

**ژیگــــول** / jîgul/: [از فرانــسوی] صـفت. [مخفـف، گفتاری/ تەرپۆش؛ خۆڕازێن؛ ژیکەڵە.

⊡ ژیگول کردن: دەقدان؛ خۆ ڕازاندنەوە؛ جلی تــازە لەبــەرکردن؛ وێ دەق دەی؛ دوخــت ئاردەی؛ خۆ پۆشتەکردن بە جلوبەرگی تـازە ‹امروز خیلی ژیگول کردەای: ئەمڕۆ زۆر خۆتـت لـە دەق داوە›.

**ژیگولت** / jîgulet، ـها/: [فرانسوی] /اسم. کچێ کە بۆ چاو پێکردنی کوڕان خۆ دەڕازێنێتەوە.

**ژیگولو** / jîgulû، ـها/: [فرانسوی] /اسم. کـوڕی لاو کە بۆ چاولێکردنی کچان خۆ دەڕازێنێتەوە.

**ژیلـــت** / jîlet/: [فرانسوی] /اسم. ژیلـت؛ نـاوی بازرگانی جۆرێ خۆتراش.

**ژیله** / jîle/: [فرانسوی از اسپانیایی] /اسم. جلیسقە؛ جلیقە؛ جلیتقە؛ جۆرە کراسێکی بێقۆڵ.

**ژیمنازیوم** / jîmnāz(i)yom، ـها/: [فرانسوی] /اسم. ژیمانزیۆم؛ جێگا یـان بەشـێک لـە شـوێنێ کـە شتومەکی پێویستی ژیمناستیکی تێدایە.

**ژیمناســـت** / jîmnāst، ـهـا/: [فرانــسوی] /اســم. ژیمناست؛ کەسێ کە شارەزای ژیمانستیکە.

**ژیمناســـتیک** / jîmnāstîk/: [فرانــسوی] /اســم. ژیمناســـتیک: ۱. وەرزشـــێ کـــە وەرزشـکار بـۆ تـەیار بـوونی لـەش و ڕاهێنـانی لـە چالاکیدا خــەریکی دەبــێ ۲. کــار و چالاکیــەکی وەرزشی بریـەتی لـە لـوول خواردنـەوە، تەقـڵە لێـــدان و وەرچـــەرخان بـــە ســـەر کەرستەگەلێکی تایبەتدا.

# س

**س** / s/: *حرف.* س؛ نیشانەی پیتی پانزدەهەم لە ئەلفوبێتکەی زمانی فارسیدا.
**س** / se/: *اسم.* ۱. سیێ؛ سین؛ ناوی پازدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی ۲. *[مخفف]* پ؛ پرسیار ‹س: کجا می‌روی؟ ج: منزل: پ: بۆ کوێ دەڕۆی؟ و: ماڵەوە› ❋ **سین**
**سآنس** / se'āns ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* سانس؛ هەر یەکە لە نۆرەکانی شاندانی فیلم لە سینما لە شەو و ڕۆژێکدا.
**ـ سا** / sā/: *پیواژه.* ۱. *[مخفف]* ـ ئاسا؛ ـ گوێن؛ ـچەشن؛ ـ ڕەنگ؛ ـ سار؛ وەک؛ هەزەی؛ شێوە ‹پری‌سا: پەری‌ئاسا› ۲. ـــ ساو؛ ـ سوو؛ ساوێن؛ ساوەر؛ ساوکەر؛ ڕێخەر ‹سفال‌سا؛ کشک‌سا: هێلەساو؛ کەشکساو›: **سای** *[ادبی]* ۳. ـــ ساو؛ ـگەژمرێن؛ ـ هاڕ؛ وردکەر ‹سنگ‌سا: بەردەساو›.
**سائر** / sā'er/: [عربی] ☜ **سایر**
**سائقه** / sā'eqe/: [عربی] ☜ **سایقه**
**سائل** / sā'el/: [عربی] ☜ **سایل**
**ـ سائی** / sā'î/ ☜ **سایی**
**سائیدگی** / sā'îdegî/ ☜ **ساییدگی**
**سائیدن** / sā'îdan/ ☜ **ساییدن**
**ـ ساب** / sāb/: *پیواژه. [گفتاری]* ـ ساو؛ ـ ماڵ؛ ـساوێن ‹کف‌ساب: کەفساو›.
**ساباط** / sābāt ، ـها/: [عربی] *اسم.* سابات: ۱. سەیوان؛ سەیڤان؛ سەیوانە ۲. سێبەر؛ سێوەر؛ سەیوەر؛ سەهەن؛ سەی؛ سا ۳. دالان؛ سیپە؛ سیپک؛ کەلەگی؛ لیوان؛ ڕێگەی سەرداپۆشراو.
**سابعاً** / sābe'an/: [عربی] *قید. [نامتداول]* ۱. حەوتمین؛ حەفتمین؛ لە پلەی حەوتمدا ۲. حەوتم؛ حەفتم؛ حەوتم‌جار؛ جاری حەوتم.
**سابق**[1] / sābeq/: [عربی] *صفت.* پێشوو؛ ڕابردوو؛ ڕابواردوو؛ بەرین؛ بەرگ؛ بەرنگ؛ وەڵین: ۱. بەرگین؛ پێشین؛ بەندیوار بە سەردەمی بەر لە ئێستاوە ‹رییس سابق دانشگاه: سەرۆکی پێشووی زانستگا› ۲. کۆن ؛ جاران؛ زوو؛ ویەردە؛ بەندیوار بەوەی بەر لە ئێستا بووە ‹این رسم و رسوم مال سابق است: ئەم داب و دەستوورە هی پێشووە›.
**سابق**[2]: *قید. [گفتاری]* جاران؛ چەلان؛ ئەوسا؛ پێشوو؛ لە ڕابردوودا ‹سابق مردم مهربانتر بودند: جاران خەڵکی دلۆڤانتر بوون›.
**سابقاً** / sābeqan/: [عربی] *قید.* جاران؛ زوو؛ لە پێشدا؛ پێشوو؛ پێشووتر؛ بەر لە ئێستە؛ لە بەرێدا؛ لەمەوبەر؛ ئەوسا؛ ئەودەم؛ لەوە پێش؛ چەلان؛ بەرێ؛ بەروو؛ زووتر؛ پێشان؛ چێوەڵ ‹سابقاً اینجا بیابان بود: جاران ئێرە بیاوان بوو›.
**سابق‌الذکر** / sābeqozzekr/: [عربی] *صفت.* ناوبراو؛ ناڤبری؛ باسکراو؛ ناو لێبراو لە پێشدا ‹در کتاب سابق‌الذکر هم آمده است: لە کتێبە

...وی ئەوەکەشدا هاتووە›.

**سابقه** / sābeqe ، ـها؛ سوابق/: [عربی]/اسم. پێشینە؛ پێشوونە: ۱. ڕابردە؛ ڕابردوو؛ ڕابوردوو؛ زانیاری لەمەڕ ڕابوردەی کەسێ یان شتێکەوە ‹سابقه‌ی او را از من بپرسید: پێشینەی ئەو لە من بپرسن› ۲. ڕووداوێک لە ڕابردوودا کە دووپات بووەتەوە ‹کشتن پدر، فرزند و نزدیکان در میان شاهان سابقه دارد: کوشتنی دایک و منداڵ و خزمان لە نێو شاگەلدا پێشینەی هەیە› ۳. ڕووداو یان دیاردەیەک لە ڕابردوودا کە ببێتە بەڵگە ‹سابقه‌ی کار: پێشینەی کار›.

◙ سابقه‌ی کار: پێشینەی کار؛ ماوەیەک کە کەسێک کارێکی بە دەستەوە بووە یان لە شوێنێکدا خەریکی کار بووە.

**سابقه‌دار** / sābeqedār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. پێشینەدار: ۱. ڕەشناو؛ بەدناو؛ خاوەن پێشینە و ئەزموون لە کاری خراپە کردندا ۲. *[حقوق]* لە لایەن دادگاوە لە ڕابردوودا بە تاوانبار دەرچوو.

**سابوتاژ** / sābotāj/: [فرانسوی]/اسم. *[سیاست]* کارشکێنی؛ چوکڵەشکێنی؛ خراپەکاری بە قەستی.

**سابیدن** / sābîdan/ ☜ **ساییدن**

**سابین** / sābîn/: [فرانسوی]/اسم. *[گیاه‌شناسی]* هەڤریشک؛ سەروەکێویلە؛ هێڤەر؛ هاڤریسک؛ عەرعەر؛ هەوریس؛ وەهل؛ ئەرز؛ ئیرڤست؛ هێڤرست؛ دارێکی بێبەری لێڕەوارییە کە باش بە خۆدا دێ و زۆر بەرز دەبێ.

**ساپروفیت** / sāprofît/: [فرانسوی] صفت. *[زیست‌شناسی]* گەنیشن؛ گەنگەش؛ بەتایبەتمەندی ڕوان لە سەر یان لە نێو ماکی زیندەڵی گەنیودا (وەک برێ کارک و باکتری).

**ساپورت** / sāport/: [انگلیسی]/اسم. *[قدیمی]* پشتیوانی؛ پشتەڤانی.

**ساتراپ** / sātrāp ، ـها/: [یونانی از فارسی باستان] اسم. *[قدیمی]* پارێزگار؛ ڕاژۆر؛ حاکم؛ والی؛ حوکمڕان (لە ئێرانی سەردەمی هەخامەنشیدا).

**ساتن** / sātan/: [فرانسوی از عربی] ☜ **ساتین**

**ساتور** / sātûr/: [عربی] ☜ **ساطور**

**ساتورن** / sātûrn/: [انگلیسی]/اسم. کەش؛ کەیوان؛ کاروان‌کوژی؛ کاران قڕە؛ سەشەم گەڕۆکی هەتاو کە ۹۵ ئەوندەی گۆی زەوییە و لە ۲۹ ساڵدا سوورێک بە دەوری خۆردا دەداتەوە و بەوە ناسراوە ئەڵقەیەکی بە دەورەوەیە کە تەنیا لە تەلسکۆپدا دەردەکەوێت.

**ساتوری** / sātûrî/: [عربی] ☜ **ساطوری**

**ساتین** / sātîn/: [فرانسوی از عربی]/اسم. ساتان؛ پارچەیەکی ساف لە هەورێشم یان ڕیون بە ڕووی بریقەدار و پشتی ماتەوە: **ساتَن**

**ساج** / sāc/: [ترکی]/اسم. ۱. ـها/ ساج؛ سێڵ؛ سێڵ؛ سێهل؛ دەفرێکی خڕ و کۆمی کانزایی بۆ نان لە سەر کردن و برێشکە تێیدا برژاندن ۲. ـها/ [معرب] تیک؛ سوورەچناری هێندی؛ دارێکی هەمیشە سەوز، تایبەتی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، بە گەڵای گەورە، چێوی سەخت و قورس و بەدەوامەوە: **تِک؛ تیک** ۳. تێک؛ تیک؛ چێوی قورس و قایمی قاوەیی مەیلەو زەردی ئەو دارە کە بۆ کەشتی‌سازی و کەلوپەلی چێوی بەکاردێت: **تک؛ تیک**

**ساجور** / sācûr/: [عربی]/اسم. سەمەندۆک؛ سنک؛ کەلەن؛ کالان؛ قەڵادە؛ مەرەس؛ قرێتە؛ ساژور؛ سانجۆل؛ سانجی؛ ساجوور؛ زنجیر، زوێڵ یان گەوی کانزایی پتەو کە لە ملی سەگ و ڕاوری دەکەن.

**ساجی** / sācî/: صفت. ساجی: ۱. [ترکی] پێوەندیدار بە ساجەوە ‹نان ساجی: نان ساجی› ۲. [معرب] لە جسنی چێوی ساج.

**ساچمه** / sāčme ، ـها/: [ترکی]/اسم. ساچمە؛ گزمووله مزی زۆرتر ورد کە لە تفەنگی ڕاو و هەندێ ئامێری پیشەسازیدا کەڵکی لێ

وەردەگرن.

**ساحت** / sāhat/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ١. *[نامتداول]* گۆڕەپان؛ مەیدان؛ پانایی؛ دەشت؛ دەڤەر؛ دەڤور ٢. پێشگا؛ بارەگا؛ بەر دەسەلات؛ جێگایێ کە کەس یا دیاردەیەک بە سەریدا زاڵە ‹ساحت او از معصیت مبراست: بارەگای وی لە گوناهـ پاکە›.

**ساحر** / sāher، ـان/: [عربی] *اسم. [ادبی]* جادووگەر؛ جادووکەر؛ سیحرباز؛ ئەفسوونکار؛ تەڵەسمباز؛ باربەژنگەر؛ چاچۆڵگەر؛ جادووکار ‹ساحری از هند به آن شهر آمده بود: جادووگەرێک لە هیندەوە هاتبوو بۆ ئەو شارە›.

**ساحرانه** / sāherāne/: [عربی/ فارسی] *قید.* جادووگەرانە؛ سیحربازانە؛ ئەفسوونکارانە: ١. وەکوو جادووگەران ٢. بە شێوەی جادوویی.

**ساحره** / sāhere، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* سخریجن؛ ژنی سیحرباز؛ ژنی جادووگەر.

**ساحری** / sāherî/: [عربی] *اسم.* جادووگەری؛ سیحربازی؛ ئەفسوونکاری.

**ساحل** / sāhel، ـها؛ سواحل/: [عربی] *اسم.* کنارێن؛ بەستێن؛ زرێوار؛ زرێبار؛ هێش؛ لێوار؛ پەراڤ؛ تنک؛ یەنک؛ زریەپەڕ؛ کەڤی؛ دەریابار؛ دەریاپەڕ؛ دەریادەر؛ لەوچک؛ بەستۆرە؛ ڕەخ/ ڕەفی ئاو؛ قەراخ/ کەنار ئاو؛ وشکانی پەنا کۆمای ئاو (زەریا، زەریاچە، چۆم).

**ساحلبانی** / sāhelbānî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* هێشەوانی: ١. چاوەدێری لە سنووری کنارێنی ئاو ٢. چاڤدێری کنارێن لە هەمبەر دیاردەگەلی کەشیەوە ٣. کار یا ڕەوتی پاراستنی ژینگەی زرێواری زەریا. هەروەها: **ساحلبان**

**ساحل‌نشین** / sāhelnešîn، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* هەڤاف؛ زرێوارنشین؛ هێش‌نشین؛ نیشتەجێی قەراخ ئاو (زەریا، زرێوار، چۆم) ‹شغل بیشتر مردم ساحل‌نشین ماهیگیری است: کاری زۆربەی خەلکی هەڤاف ماسی‌گرتنە›.

**ساحلی** / sāhelî/: [عربی] *صفت.* بەستۆرەیی؛ هێشی؛ زرێواری؛ زرێباری؛ کنارێنی؛ زریەپەڕی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە ڕەخی ئاو ‹زمینهای ساحلی: زەوینگەلی بەستورەیی› ٢. هەڵکەوتە لە زرێواردا ‹کلبەی ساحلی: کۆلیتی هێشی›.

**ساخارز** / sāxāroz/: [از فرانسوی] ☜ **ساکارز**

**ساخارین** / sāxārîn/: [از فرانسوی] ☜ **ساکارین**

**ساخت** / sāxt/: *اسم.* ١. پێکهاتە؛ پێکهات؛ دەسکرد ‹ساخت محکمی دارد: پێکهاتەیەکی پتەوی هەیە› ٢. دەسکر؛ دەسکرد؛ کار یا ڕەوتی سازکردن؛ دروس‌کردن؛ چێ‌کرن؛ وەش کەردەی ‹ساخت هواپیما: چێ‌کرنی فڕۆکە› ٣. کرد؛کر؛ دەسکر؛ دەسکرد؛ پێکهاتگ؛ چێکراو؛ سازکراو؛ دروس‌کراو ‹ساخت اورامان: چێکراوی هەورامان› ٤. *ـها/ [دستور]* شێوەیەک لە وشە کە کەس یان کاتی پێوەندیدار بە کارەوە نیشان دەدا: **صیغه** ٥. *ـها/ [قدیمی]* زین و بەرگ.

**ساختار** / sāxtār، ـها/: *اسم.* پێکهاتە؛ کردمان: ١. چۆناوچۆنی داڕێژراوی شتێک ‹ساختار فلزی: پێکهاتەی کانزایی› ٢. شێوازی ڕێک‌خستن و چنینی بەشگەلی شتێک ‹ساختار نردبانی: پێکهاتەی پلەکانی› ٣. پێکهاتوو؛ پێکهاتگ؛ کر؛ کرد؛ بەرهەم؛ چێکراو؛ شتی درووسکراو (وەک خانووبەرە).

▣ **ساختار ملکولی**: پێکهاتەی مولوکوولی؛ شێوەی داڕێژرانی ئەتومگەلی پێکهێنەری مولوکوولێک.

**ساختارگرایی** / sāxtārgerāyî/: *اسم.* پێکهاتەخوازی: ١. یەکێک لە ڕێبازە هزرییەکانی مەردمناسی کە لە لایەن ڕادکلیف براون (مەردمناسی کۆمەلایەتی بریتانیا) و کلود لوی شتراوس (پێکهاتەخوازی مەردومناسی فەرانسە)ەوە بەدی هات و لەم ڕێبازەدا دیاردەگەل بە گوێرەی پێوەندیان پێکەوە دەناسرێن ٢. شێوازی شرۆڤە و شیکاری

(دەقێکی ویژەیی یان سیستەمێکی سیاسی) لە پێوەندی دەگەڵ مەردمناسی و بە پێیی شانەگەلی فەرهەنگی و کردەوەیی.

**ساختاری / sāxtārî/:** *صفت.* پێکهاتەیی؛ پێوەندیدار بە پێکهاتەوە ‹ویژگیهای ساختاری: تایبەتمەندیگەلی پێکهاتەیی›.

**ساختگی / sāxtegî ، ـها/:** *صفت.* هەڵبەستە؛ دەس هەڵبەست: ١. دەسکردی؛ دروووسکراوە؛ نەک ڕاستەقینە ‹عصبانیت ساختگی: تووڕەیی هەڵبەستە› ٢. درۆینە؛ ساختەکارانە؛ ساختەچییانە؛ ساختەیی ‹این سند ساختگی است: ئەم بەڵگە هەڵبەستەیە›.

**ساختمان / sāxtemān/:** *اسم.* ١. کار و ڕەوتی کردنەوە؛ سازکردن؛ چێکرن؛ درووس کردن؛ سازاندن؛ وەش کەردەی؛ کەردەیوە؛ ئەوەکەردەی ‹ساختمان صد دستگاه آپارتمان آغاز شد: کردنەوەی سەد دەزگا وارخان دەستی پێکرد› ٢. پێکهاتە ‹ساختمان چشم: پێکهاتەی چاو› ٣. ساختمان؛ خانووبەرە؛ خانی؛ خانوو؛ یانە؛ ماڵ؛ بەر و شوێنێکی کەم تا کورت کلیدە و سەرگیراوی هەمیشەیی بۆ نیشتەجێ بوون، کار، ڕاگرتنی گیانەوەران و پیتەوا، کە بە کەرەستەی خانووبەرە دەکرێتەوە ‹ساختمان اداری: خانووبەرەی مەزرینگەیی›.

▣ **ساختمان آجری:** خانووبەرەی ئاجۆری؛ خانووبەرەی کەرپووچی؛ خانووبەرەیەک کە لە دیوارەکانیدا ئاجۆر دەکارکراوە. هەروەها: **ساختمان سنگی؛ ساختمان سیمانی**

**ساختمان پیش‌ساخته:** خانووی پێشکردە/ پێش‌ساز؛ خانووبەرەی لە پێش سازکراو؛ بینایەک کە پاژەکانی لە کارگەدا چێکرابێ و پاشان لە شوێنی خۆیدا دامەزرێ.

▣ **ساختمان کردن:** کردنەوەی ساختمان؛ خانوو کردنەوە؛ کردنەوە؛ چێکرنی خانوو؛ ماڵ درووس کردن؛ خانی کردنەوە؛ بیناکردنەوە؛ ماڵ کردنەوە؛ یانەوەکەردەی؛ یانەکەردەیوە ‹در کوچەی ما دارند ساختمان می‌کنند: لە کۆڵانی ئێمەدا خەریکی خانوو کردنەوەن›.

**ساختمانی / sāxtemānî/:** *صفت.* ساختمانی؛ خانووبەرەیی؛ پێوەندیدار بە ساختمانەوە ‹فعالیت ساختمانی: چالاکی ساختمانی›.

**ساختن / sāxtan/:** *مصدر. متعدی. لازم. //* **ساختی:** دروستت کرد؛ **می‌سازی:** دروست دەکەی؛ **بساز:** دروست بکە// ◻ *متعدی.* ١. دروست/ درووس کردن؛ چێکرن؛ سازدان؛ سازکردن؛ ڕێک هاوردن؛ خاس کردن؛ سازای؛ کردن؛ کردنەوە؛ بەدیهێنانی پێکهاتەیەک لە ڕووی گەڵاڵە و بە پێی بنەماگەلی دەست نیشان‌کراو و کەل‌وپەلی تایبەتەوە ‹خانە ساختن؛ آهنگ ساختن: ماڵ‌کردنەوە؛ ئاهەنگ دروست کردن› ٢. هەڵبەستن؛ درووس کردن؛ هۆربەسەی ‹دروغ ساختن: درۆ هەڵبەستن› ٣. سازاندن؛ بەرهەڤ کرن؛ گیڤ کردن؛ لەبارکردن؛ گیزکردن؛ خۆش کردن؛ وەش کەردەی؛ سازکردن؛ ئامادەکردنی کەسێک بۆ کارێک یان شتێک ‹با مشروب خودش را ساخت و برگشت: بە خواردنەوە خۆی سازاند و گەڕاوە› ٤. *[ادبی]* کردن؛ کرن؛ کەردەی ‹عصبانی ساختن: تووڕەکردن› ٥. *[مجازی]* خۆش کردنەوە؛ وەشەوەکەردەی؛ هێنانەوە دەق ‹دو تا از این قرصها را که خوردم، مرا ساخت: دوان لەم قورسانەم کە خوارد، خۆشی کردمەوە› ٦. *[مجازی]* ڕازاندنەوە؛ دورس کردن؛ ئەوەڕازنەی؛ ئارایشت‌کردن ‹مردها خودشان را مثل زن‌ها می‌سازند: پیاوان خۆیان وەک ژنان دەڕازێننەوە› ٧. کردن؛ کولاندن؛ لێنان؛ کەردەی؛ وەش کەردەی؛ نانە سەر؛ پێکهانین ‹غذا ساختن: چێشت‌کردن› ◻ *لازم.* ٨. سازیان؛ سازین؛ سازان؛ ساچان؛ ساچەی؛ ساچای؛ پێکهاتن؛ هەڤ‌هاتن؛ لێک‌هاتن؛ سازشت‌کردن: *الف)* سەرکردن؛ بردنە سەر؛ لەگەڵ کەسێک یان شتێکدا هەڵکردن و نەرم و نیانی نیشان دان ‹با

ســختیها ســاختن: بــه ســه‌خـــڵه‌تیه‌وه ســاچن›
ب) هاوده‌ستی کردن؛ ده‌ست کردنه یه‌ک ‹با قاضــی ســاختن: له‌گــه‌ڵ دادوه‌ردا ســازان›
ج) پێ که‌فتن؛ بژوون بوون؛ سازگار بوون ‹هوای اینجا با او نمی‌سازد: هـه‌وای ئێره‌یه پـێ ناکـه‌فێ›
٩. *[مجازی]* پێکـه‌وتن؛ لێـک جـۆر بـوون؛ جـۆر ده‌رهاتن؛ پێ خواردن. هه‌روه‌ها: **ساختنی**
■ صـفت فـاعلی: **سـازنده** (دروسـتکه‌ر)/ صـفت مفعولی: **ساخته** (دروستکراو)/ مصدر منفی: **نَساختن** (دروست نه‌کردن)

**سـاخت‌وپاخــت** / sāxt-o-pāxt ، ـهـا/: *اسم، [مجازی، گفتاری]* کاکه‌وبراله؛ بـه‌ن‌وبـه‌س؛ ساز و باز؛ ساز و پاز؛ ساخت و پاخت؛ خلێنـه و بلێنـه؛ سازشت و هاوده‌ستی بۆ پیلانگێڕان.
⊡ **ساخت وپاخت کردن:** *[مجازی]* سازوبازکردن؛ کاکه‌وبرالـه‌کردن؛ ســاخت‌وپاخـــت کـــردن؛ بڕیاردانان بۆ گێڕانی پیلانێک ‹ارباب با پلیس ساخت‌وپاخت کرد و آزاد را انداخت زندان: ئاغا له‌گه‌ڵ پولیــسدا ســاز و بـازی کـرد و ئـازادی خـسته به‌ندیخانه‌وه›.

**ساخت‌وساز** / sāxt-o-sāz ، ـهـا/: *اسم، [گفتاری]* کرد و کار؛ کار و ڕه‌وتی کردنه‌وه‌ی خانووبه‌ره.

**ساخته**[1] / sāxte ، ـها/: *اسم،* ده‌سـکار؛ ده‌سـکرد؛ کار ‹ساخته‌های سنگی: ده‌سکرده به‌ردینه‌کان›.

**ساخته**[2]: *صفت.* ١. هه‌ڵبه‌سته؛ ده‌س‌هه‌ڵبه‌سـت؛ درۆینـه ٢. *[مجـازی]* پێـک‌هێنـراو؛ دروسـکراو؛ به‌رهه‌م‌هێنراو.
⊡ **ساخته بودن/ نبودن:** لێ هـاتن/ نـه‌هاتن؛ لـێ وه‌شانه‌وه/ نه‌وه‌شانه‌وه؛ ئامـه‌ی/ نامـه‌ی چنـه؛ چه‌نه ئامای/ نامـای؛ سـزا بـوون/ نـه‌بوون بـۆ جێبه‌جێ کردنی کارێک ‹این کـار از مـن ساخته نیست: ئه‌م کاره‌م لێ نایه‌ت›.

**ساخته و پرداخته** / sāxte-vo-pardāxte/: *صفت.* ئاماده؛ ساز؛ په‌ڕکاڵ؛ لێک‌وله‌بار؛ په‌رداخ؛ ساز و له‌بار ‹دو سال طول کشید تا پل ساخته و پرداختـه شـد: دوو سالی خایاند تا پرده‌که ساز بوو›.

**ساخلو** / sāxlo. sāxlo: ، ـها/: [ترکی] *اسم، [قدیمی]* سپاگه؛ سه‌ربازخانه؛ سپاخانه؛ پادگان.

**سادات** / sādāt/: [عربی] جمعِ ☜ **سیّد**

**سادســاً** / sādesan/: [عربـی] *قیـد. [نامتـداول]* ١. شه‌شه‌مین؛ له پله‌ی شه‌شـه‌مدا ٢. شه‌شـه‌م؛ جاری شه‌شه‌م؛ شه‌شه‌م‌جار.

**سادگی** / sādegî ، ـهـا/: *اسم.* ١. سانایی؛ ئاسانی؛ هاسانی؛ سه‌ناهی؛ ساکاری؛ هێسایی ‹موضوع بـه این سادگی را نمی‌فهمی!؟: بابه‌تی وا سانا تێناگـه‌ی!؟› ٢. سـاکاری؛ سـانایی؛ سـاوایی؛ چۆنیـه‌تی بـێ نه‌قش و نیگـار بـوون ٣. *[مجـازی]* سـاویلکه‌یی؛ ساوایی؛ سایلۆحی ٤. ساکاری؛ ساده‌یی؛ دۆخـی زێو و زه‌مبـه‌ر نـه‌بوون؛ چۆنیـه‌تی سـاکار بـوون ‹سـادگی بهتـرین زینـت اسـت: ساکاری جـوانترین ڕه‌وشته›.

**ساده** / sāde ، ـها/: *صفت.* ١. ساده؛ ساکار؛ بـه‌بێ نه‌خش و ڕه‌وش و ئارایشت ‹لباس ساده: بـه‌رگی ساکار› ٢. ساکار؛ ساده؛ به‌بێ تایبه‌تمه‌ندییـه‌کی بـه‌رچاو (وه‌کـوو خـاڵ، هه‌ڵـقوپاوی، داقوپـاوی، بـه‌رچاوی و...) ‹دیـوار ساده: دیـواری ساکار› ٣. سـاکار؛ سـاده؛ ئاسـایی؛ بـه بـێ نمـوود و سـه‌رنجڕاکێـشی ‹زنـدگی ساده: ژیـانی ساکار› ٤. سانا؛ هاسان؛ هێسا؛ سـه‌نا؛ گانگـاز؛ نـه‌دژوار؛ بێ‌گرێ و گۆڵ ‹کار ساده: کـاری سانا› ٥. سانا؛ ئاسان؛ هاسان؛ سه‌نا؛ هێسا؛ بێ‌گرێ؛ گانگاز؛ فام هاسان ‹پرسش ساده: پرسیاری سانا› ٦. *[مجـازی]* ساویلکه؛ ساده؛ ساده‌کار؛ ساده‌لۆح؛ سـاده‌لۆک ‹تو چقدر ساده‌ای!: تۆ چه‌ند ساویلکه‌ی!› ٧. سـاده؛ ساکار؛ به‌بێ شاره‌زایی و پسپۆڕی له پیشه‌یێکدا ‹کارگر ساده: کرێکـاری ساده› ٨. سـاده؛ سـاکار؛ ڕووت؛ پاک؛ ساف؛ بێ‌خه‌وش؛ پـه‌تی؛ ناتێکـه‌ڵاو ‹آب ساده: ئاوی ساده› ٩. ساده؛ ساکار؛ بێ ئه‌زوا و به‌هارات و چه‌وری و... ‹آش ساده: چێشتی ساده› ١٠. ساده؛ بێ گـرێ؛ سـاکار؛ بـه‌بـێ لـه‌ت یـان

تــوخمی زۆری جۆراوجــۆرەوە ‹جملــەی ســادە: ڕستەی سادە›.

**ســادەدل** / sādedel ، ـھا؛ ـان/: *صفت. [مجازی]* ١. دڵپاک؛ دڵپاکژ؛ خێـوی دڵ و بـیری پـاک و بێخەوش، خۆشباوەڕ و گەشبین ٢. سـایلۆح؛ سادەلۆح؛ سادەلۆک؛ بـێ پـێچ و پـا؛ سـاویلکە؛ سادەکار.

**ســادەرو** / sāderû ، ـھا؛ ـیان/: *صفت.* دەکـەل؛ بـێمـوو؛ بـێتـووک؛ سـادە؛ لـووس؛ دەمڕووت؛ کوڕی هێشتا موو لێ نەڕواو.

**سادەلوح** / sādelowh, -lo:h ، ـھا؛ ـان/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت. [مجـازی]* فــەقیرحاڵ؛ ســادە؛ ســـادەلۆک؛ ســـادەلۆح؛ ســـایلۆح؛ ســاویلکە؛ سافیلکە؛ زووباوڕ؛ سادەکار؛ بە سەرمان و گێـل. هەروەها: **سادەلوحی**

**ســـادەنویـــسی** / sādenevîsî ، ـھــا/: *اسـم.* ساکارنووسی؛ سادەنووسی؛ چۆناوچۆنی نووسین بە وشەی سانا و ڕستەی کورت بە جۆرێـک کـە هەموان لێی تێبگەن. هەروەها: **سادەنویس**

**سادیـــست** / sādîst ، ـھــا/: [فرانــسوی] *صـفت.* سادیـــست؛ ئـــازاردەر؛ تووشـــیاری نەخۆشــی سادیسم.

**سادیـــــسم** / sādîsm/: [فرانـــــسوی] *اســـم.* ١. *[روانشناســـی]* سادیـــــسم؛ ئـــــازاردەری؛ نەخۆشـینێکی ڕەوانیـە کـە تێیـدا، دامرکـانی جینـسی نـەخۆش، لـە گرێـوی ئـازاردانی هاولفەکەیدایە. ئەم ناوە وەرگیراو لە ناوی مارک دو ساد (١٧٤٠-١٨١٤ ز.) نووسەری فەرانسەویە، کـە بـە هــۆی ئازارگەیانــدن و کوشـــتنی هاوسەرەکانی، زینـدانیکرا و دوایـی بـە هـۆی نووسـینی چیرۆکـە شـەرمشکێنەکانی بـەرەو تیمارستان بەڕێکرا ٢. *[مجازی]* مـەردمئـازاری؛ کارەڕەهـاتی خەڵـک تووشــی زەحمــەت و دەردیسەر کردن.

**سار** [1] / sār ، ـھا/: *اسم.* ڕیشۆڵ؛ ڕێشۆڵ؛ ڕێشۆڵە؛ ڕێشۆڵە؛ ڕێشۆلی؛ ڕەشۆڵە؛ ڕەشۆلی؛ ڕەشیلە؛ ڕەشێـلە؛ گــاوانی؛ شــاروور؛ شــالوور؛ شــالوول؛ شــاوو؛ شالوویل؛ شالیل؛ کەشوشکە؛ کەشۆیلە؛ سـێروو؛ ســیاکەرک؛ ســوێروو؛خــەزایی؛ عەینەمـــەڵ؛ عایلەمــەن؛ ئایلەمــەن؛ ئایرەمـەڵ؛ ئەیرەمــەڵ؛ مرچیلە؛ مرچۆلـە؛ قـازەڵاخ؛ قـازڵاخ؛ قـازڵاخی؛ تەیتۆک؛ تیتک؛ تیتڵ؛ تـیتی؛ ئاگرەمـەلووچک؛ ئاگرەمەلیچ؛ ئودرمەلیچ؛ مەلێکی گچکەی دەنگ دەرهــاتووی پــڕ قیــژ و قــاژە، دەمەلاسـکەی مەلانیتر دەکاتەوە، ڕەشی بریقەونی کەسـک و ئەرخوانیە، پەڵوپۆی دە زسـتاندا پـڕ لـە خاڵـی سپی دەبێ، جووچکی گچک، باڵی نووک تیـژ و دەندووکی درێژ و تیژە، فڕینی بەلەز و ڕێکە و بە کۆمەڵ و لە پۆلی گەورەدا هەڵدەفڕن.

▣ **سار آبی:** نوقمۆکە؛ باڵندەیەکی چۆلەکەئاسای لای ئاوە، بە لەشی ڕەش و سینگی سپی کـە بۆ ڕاوی ماسی خۆی لە ئاودا نوقم دەکا.

**سار کنـەخـوار آفریقـایی:** شـوان خەڵـەتێنە؛ باڵندەیێکی لـە تـیرەی ڕیـشۆڵە، بـە ڕەنگـی قاوەیی و زەرد و سوور، شوێن ئاژەڵ دەکەوێ و گەنە و مێشی سەر لەشیان دەخوا.

**ـ سار** [2]**:** *پسوند.* ـ سار: ١. ـ یان؛ ـ سـاڵ؛ شـوێنی شـتێک ‹کـوەسـار؛ گرمـسار: کۆسـار؛ گـەرمیان› ٢. وێنە؛ شێوە ‹سگسار: سەگسار› ٣. ـــ ئاسا؛ ـچەشن ‹خاکسار: خاکەسـار› ٤. لا؛ سـۆ ‹رخسار: ڕوخسـار› ٥. ـــ زار؛ خـاوەن بـار و چۆنیەتیـەک ‹شرمسار: شەرمەزار›.

**سارافن** / sārāfon ، ـھا/: [روسی] *اسم.* سـارافۆن؛ کەوایەکی ژنانەی بێقۆڵ و یەخە کـە بـە سـەر کراسدا دەکرێتە بەر.

**ساران** / sārān/: *اسم. [قـدیمی]* کـەبار؛ سـەرەتا؛ دەسپێک.

**ساربان** / sār(e)bān ، ـھا؛ ـان/: *اسم.* سـارەوان؛ ســالوان؛ سالــڤان؛ وشــترەوان؛ هێــشترڤان؛ شووڤـکڤـان؛ حوشـتروان؛ شـڤانی دەڤـەهان؛

کاروانڤان؛ شوانی وشتران.
**ساردین** / sārdîn ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* ساردین: ١. هەر یەکە لە دەیان جۆر ماسیگەلی بچووک کە کونسیرویان لێ دروست دەکەن ٢. بێچوە ماسی کونسیروکراو ٣. قوتووی جێ گۆشتی ماسی کونسیرو.
**سارسل** / sārsel/:[؟] *اسم.[جانورشناسی]* سۆنە؛ مراوییێکی بچکۆلە بە پشتی قاوەیی مەیلەو سپی و سەری خەنەییەوە.
**سارغ** / sāroq ، ـها/: [ترکی]/*اسم.[قدیمی]* پرێسکە؛ پریاسکە؛ پریزە؛ تۆشەبەرە؛ بوخچە؛ پارچەیەکی چوارگۆشە بۆ کەلوپەل تێنان.
**سارق** / sāreq ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/*اسم.[ادبی]* دز.
▣ **سارق مسلّح:** جەردە؛ چەتە؛ دزی چەکدار.
**سارکپت** / sārkopt ، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.[جانورشناسی]* سچ؛ زچ؛ چنگنە؛ تورنوو؛ ئەسپێی بەرد؛ مێروویەکی بچووک و تووشە لە ژێر پێستدا دەژی و دەبێتە هۆی گەڕی.
**سارگپه** / sārgape ، ـها/: [؟]/*اسم.* ١. ☜ **سنقر** ٢. پەلەوەرێک، بە باڵی پانی قاوەیی و دووی گەورە و ملی کورت و فڕینی قورس و خاوەوە کە زۆرتر مردارەوەبوو دەخوا.
▣ **سارگپەی جنگلی:** سنقر عسل‌خوار ☜ **سنقر**
**ساروج** / sārûc/:*اسم.* سارووج: ١. جاڕوو؛ تێکەڵاوی قسڵاو و خۆڵەمێش بۆ سواغدانی حەوز و... کە پێش دروستبوونی سیمان باوی هەبوو ٢. *[کالبدشناسی]* جۆرە شانەیەکی ئێسکی کە ڕیشەی ددانی مۆرغەداران دادەپۆشێ.
**ساروی** / sāravî ، ـها؛ ـان/: *صفت.* سارەوی: ١. سەربە شاری ساری لە مازەندەراندا ٢. خەڵکی شاری ساری لە باکووری ئێران.
**ساری**[1] / sārî ، ـها/:[هندی] *اسم.* ساری؛ گنجێکی ژنانی هیند و پاکستانە، بە شێوەی پارچەیەکی سۆک و درێژ کە سەرێکی وەک پشتێن دەبەستن و ئەو سەرکەشی بە سەر شان یان سەریدا دەدەن.
**ساری**[2]: [عربی] *صفت.[ادبی]* گیرۆ؛ درم؛ پەتا.
**ساریغ** / sārîq/: [از فرانسوی] ☜ **ساریگ**
**ساریگ** / sārîg ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* ساریگ؛ گیانەوەری گوانداری چکۆلەی دارژی ناوچەی ئەمریکا، لە تاقمی کیسەداران کە هەموو شت خۆر و شەوگەڕە: **ساریغ؛ أپوسوم**
**ساز**[1] / sāz ، ـها/:*اسم.* ١. ساز؛ ئامرازی مووسیقا؛ ئامێرێ کە ئاهەنگی مووسیقی پێ دەژەنرێ ٢. ئاهەنگ ٣. *[قدیمی]* ئامراز؛ ئامێر؛ ئەسپاو (بە گشتی) ٤. *[قدیمی]* ئامێری شەڕ ٥. سات؛ پێداویستی؛ ئەوەی بۆ ئەنجامدانی کارێک پێویستە ٦. *[قدیمی]* ڕێ و ڕەوش؛ زێ؛ ڕێگا؛ ڕێباز ٧. *[قدیمی]* بەرگ؛ گنج؛ هنجگ ٨. *[قدیمی]* سامان ٩. *[قدیمی]* ساز؛ کار یان ڕەوتی سازیان؛ ساز بوون.
▣ **ساز بادی:** سازی بایی/ باژەن؛ هەریەک لەو سازانە بە هاتوچۆی با دێنە دەنگ (وەکوو: نەی، شمشاڵ و سڕنا و...).
**ساز دهنی** ☜ **سازدهنی**
**ساز زهی:** سازی ژێدار؛ ژێژەن؛ هەریەکە لەو سازانەی بە بزواندنی تەلەکانیان دێنە دەنگ (وەک دیوان، تار، سێتار، تەمبوور، کەمانچە، ویۆلۆن، سەنتوور و...)
**ساز ضربی/ کوبه‌ای:** سازی زەربی/ کوتانی/ لێدەری؛ هەرکام لە ئامێرگەلی مووسیقا کە بە لێدان دەژەندرێ (وەکوو: دەف، دمەک، دەوڵ، تەپڵ و...).
▣ **ساز زدن:** ساز ژەندن؛ ساز لێدان ‹آرام چه سازی می‌زند؟: **ئارام چ** سازێک دەژەنی؟›.
**ساز کردن:** ژەندن؛ لێدانی ئاهەنگ ‹نغمه‌ی تازه‌ای ساز کرد: **ئاهەنگێکی نوێی** ژەند›.
به ساز کسی رقصیدن: *[کنایی]* بە هەوای/ بلوێری کەسێ هەڵپەڕین؛ بە ئەنگوستی

کەسێ گەڕان؛ بەهۆی نەزانییەوە کەوتنە دووی قسەی کەسێک ‹دیگر حاضر نیستم به ساز تو برقصم: چیدی بە هەوای تو هەڵناپەرم›.

**هر روز سازی زدن**:*[مجازی]* هەر تاوێ لە سەر هەوایێ/ بە زمێ بوون؛ هەردەمە لە سەر وازێک بوون؛ هەر ڕۆژێک داخواز و ئاکارێ نواندن.

**ـ ساز**[2]: *پیوازه*. ١. ـ ساز؛ چێکر؛ ـ وەدیهێن؛ ـ وەش کەر ‹آهنگساز: ئاهەنگساز› ٢. ـ ساز؛ ـ وەش کەر؛ چاک کەرەوە ‹رادیوساز: ڕادیۆساز› ٣. ـ بین؛ ـ وین؛ ـ ساز؛ دابینکەر ‹چارەساز: چارەبین› ٤. *[ادبی]* ـ گیر؛ ـ ساز؛ ـ دامەزرێن ‹انجمن‌ساز: کۆڕگیر› ٥. ـ هەڵبەس؛ ـ هەڵوەس؛ ـ هەڵبەست؛ ـ تاش ‹سندساز: بەڵگەهەڵبەس› ٦. ـ ساز؛ ـ ساچ؛ تەبا؛ ساچەر ‹ناساز: نەساز› ٧. دروستکراو؛ چێکراو؛ وەش کریا: *الف)* ـ کرد؛ ـ کر؛ ـ ساز؛ بەهۆی کەسێ یان شتێک ‹دستساز: دەسکرد› *ب)* ـ ساز؛ لە ماوەیەکی دیاریکراودا ‹نوساز: تازەساز›

**سازا** / sāzā /:*اسم*. پێکهێنەر؛ پێکهێن؛ هەرکام لە بەشە پێکهێنەرەکانی شتێک.

**سازبندی** / sāzbandî ، ـها/:*اسم*. ڕێکوپێک کردنی ئاهەنگێک بۆ لێدان لە لایەن ئورکێستر یان گرووپی مووسیقاوە.

**سازج هندی** / sāzac-e-hendî /:*اسم*. *[گیاهشناسی]* کشمیش هیندی؛ دەوەنێکە بەرەکەی تام و بۆنێکی خۆشی هەیە و ناوکەکەی شیرینە.

**سازدهنی** / sāzdahanî ، ـها/:*اسم*. سازدەمی؛ سازێکی بایی بچووک و درێژۆکەیە بە هەناسە دەژەنرێ.

**ساززن** / sāz.zan ، ـها/:*اسم*. ژەنیار؛ سازژەن؛ سازبەند؛ مووسیقاژەن، بەتایبەت سازە ژێدارەکان.

**سازش** / sāzeš ، ـها/:*اسم*. ١. سازشت؛ وێکەوتوویی؛ ڕێکاتی؛ کاریان ڕەوتی سازان؛ سازین؛ ساچین؛ پێ کەوتن؛ پنە/ پەنەکەوتەی ‹هوای اینجا با مزاج من سازش ندارد: هەوای ئێرە بە دەماخی من ناسازی› ٢. هاودەنگی؛ سازشت؛ سازش؛ تەبایی؛ ڕێکاتی؛ کار یان ڕەوتی سازیان؛ ساچان؛ سازان؛ ساچای؛ ساچیەی؛ ساچیای؛ کران؛ کریان؛ کریەی؛ کەوتنە یەک؛ ڕێک کەوتن؛ پێکهاتن؛ گونجان؛ کەوتەی وریو؛ ساز هاتن؛ لەڤهاتن ‹زن و شوهر با هم سازش ندارند: ژن و شوو پێکەوە هاودەنگییان نیە› ٣. ئاشتی؛ سازشت؛ کار یان ڕەوتی ئاشت بوونەوە ‹با پادرمیانی همسایه‌ها سازش کردند و روی همدیگر را بوسیدند: بە نێونجیگەری دەراوسێیەکان ئاشتیان کردەوە و یەکتریان ڕامووسی›.

▣ **سازش داشتن**: تەبا بوون؛ سازگار بوون؛ سازان؛ ساز هاتن؛ سازیان؛ کران؛ کریەی.

**سازش کردن**: سازیان؛ سازان؛ سازش کەردەی؛ پێکهاتن: ١. لێک هاتن؛ هاوبار بوون؛ هاودەنگی کردن؛ هاوڕێ یان هاودەست بوون ٢. ئاشت کردنەوە؛ ئاشتەو کردن.

هەروەها: **سازش دادن**

**سازشکار** / sāzeškār ، ـها؛ ـان/: *صفت*. سازشکار؛ خۆڕێخەر؛ هۆکارە بە سازیان لەگەڵ کەسان، بەتایبەت بۆ خۆ پاراستن لە شەڕ و مەترسی ‹پدرش آدم سازشکاری بود و با همه می‌ساخت: بابی مرۆڤێکی سازشکار بوو دەگەڵ هەمووان‌دا پێک دەهات›. هەروەها: **سازشکاری**

**سازشکارانه**[1] / sāzeškārāne /: *صفت*. سازشکارانە؛ خۆ ڕێخەرانە ‹رفتار سازشکارانه: ئاکاری سازشکارانە›.

**سازشکارانه**[2]: *قید*. سازشکارانە؛ خۆڕێخەرانە؛ بە سازشکاریەوە؛ بە شێوەی سازشکاران ‹سازشکارانه لبخندی زد و هیچ نگفت: سازشکارانە بزەیەکی کرد و هیچی نەگوت›.

**سازشناسی** / sāzšenāsî /: *اسم*. سازناسی؛

بەشێک لە هونەری مووسیقا کە دەپەرژێتە سەر ناسینی ئامرازگەلی مووسیقا و چۆنیەتی بەکار هێنانیان.

**سازشنامه** / sāzešnāme ، ـها/:اسم. سازشنامە؛ نووسراوەیێ کە دوو لایەنی کێشە بە پەزێرانی مەرجگەلی ڕەچاوکراو دوایی بە ناکۆکی یان دژایەتی نێوانیان دێنن.

**سازگار** / sāz(e)gār/: صفت. جۆر؛ سازگار؛ سازیار: ١. هاوئاهەنگ؛ بە توانایی ڕێک و لەبار بوون و لێکهاتن ‹این رنگها با هم سازگار نیستند: ئەم ڕەنگانە پێکەوە جۆر نین› ٢. ساز؛ کۆک؛ خاوەن توانایی یان ئۆگرەتی بە هاوکاری، هاوڕێیی یان پێکەوە ژیان ‹بچەها با هم سازگار بودند: مندالەکان پێکەوە ساز بوون›. هەروەها: **سازگار بودن؛ سازگار شدن؛ سازگار کردن**

**سازگاری** / sāz(e)gārî/:اسم. جۆری؛ سازگاری؛ سازیاری: ١. بار یان چۆنیەتی جۆر بوون؛ سازگار بوون؛ سازیان؛ ساچان؛ پێکهاتن ٢. *[زیست‌شناسی]* گۆڕانکاری یەک یان چەن ئەندامی لەشی زیندەوەر بە پێی پێداویستیگەلی ژینگەکەی. هەروەها: **سازگاری داشتن؛ سازگاری یافتن**

**سازمان** / sāz(e)mān ، ـها/:اسم. ڕێکخراوە؛ ڕێخراوە: ١. ناوەندێک کە لە لایەن چەن تاقم یان دەولەتەوە بۆ گەیشتن بە ئارمانجێک داندراوە ‹سازمان ملل متحد: ڕێکخراوەی نەتەوە یەکگرتووەکان› ٢. یەکەی سەربەخۆی کارگێڕی کە بەڕێوەبەرەکەی زۆرتر لە لایەن سەرۆک کۆمار یان وەزیرەوە هەڵدەبژێردرێ و دەسەڵاتی لە هەموو وڵاتدا بەربڵاوە ‹سازمان محیط زیست: ڕێخراوەی پاراستنی ژینگە› ٣. کۆمەڵەیەکی ئامانجدار کە شوێنکەوتووی سیستەمێکە ‹کار جمعی نیازمند سازمان است: کاری بە کۆمەڵ پێویستی بە ڕێخراوەیە› ٤. پێکهاتە ‹پس از انقلاب ایران سازمان نیروهای مسلح تغییر کرد: پاش ڕاپەڕینی ئێران ڕێکخراوەی هێزە چەکدارەکان گۆڕدرا›.

▣ **سازمان امنیت**: ڕێکخراوەی ئاسایش؛ ناوەندێ لە برێ لە وڵاتاندا بۆ بەربەرەکانێ دەگەڵ چالاکی نەیارانی حکوومەت یا نەیارانی قازانجی گەلدا.

▣ **سازمان دادن**:ڕێکخستن؛ پێکهێنان ‹باید اول نیروهای فعال را سازمان داد: سەرەتا پێویستە هێزە چالاکەکان ڕێک بخرێن›. هەروەها: **سازمان بخشیدن؛ سازمان داشتن؛ سازمان یافتن**

**سازمانبندی** / sāz(e)mānbandî ، ـها/:اسم. کار یان ڕەوتی دیاری‌کردنی بەشە جۆربەجۆرەکانی ڕێکخراوە یان پێکهاتەیەک لە باری چۆنیەتی پێوەندیان پێکەوە و پلەکبەندی نێوانیان.

**سازماندهنده** / sāz(e)māndahande ، ـها؛ ـگان/:اسم. ڕێکخەر؛ کەس یان ڕێکخراوەیێ کە دامەزراوە؛ بزاڤ یان چالاکیەک بەڕێوە دەبا ‹سازماندهندەی تظاهرات، انجمن دانشجویی بود: ڕێکخەری خۆپیشاندانەکە، ئەنجومەنی خوێندکاران بوو›.

**سازماندهی** / sāz(e)māndehî ، ـها/:اسم. ڕێخەری؛ کار و ڕەوتی ڕێکخران؛ ڕێخران؛ ڕێک‌خستن؛ ڕێک‌وپێکی لە شوێن یان شتێکدا بەدی هێنان ‹نیروها به خوبی سازماندهی شده بودند: هێزەکان بە چاکی ڕێخرابوون›.

**سازمانی** / sāz(e)mānî/: صفت. ڕێکخراوەیی؛ ڕێخراوەیی: ١. پەیوەندیدار یان بەستراو بە ڕێکخراوەوە ٢. ئەندامی ڕێکخراوەیەکی تایبەت (وەک ڕێکخراوەی ئاسایش).

**سازمند** / sāzmand/: صفت. ڕێخراو؛ ڕێکخراو؛ بەرهەڤ؛ پۆڕمەند؛ مرێس؛ لەبار و تەکووز؛ هەڵپەڕتاو.

**سازندگی** / sāzandegî ، ـها/:اسم. ١. داهێنەری؛ سازێنەری؛ بار و دۆخی سازێنەر بوون ‹من در این برنامه هیچ سازندگی نمی‌بینم: من لەم بەرنامەیەدا هیچ داهێنەریەک نابینم›

٢. ئاڤادسازی؛ ئاوەدان‌کاری؛ ئاوادکاری؛ کار یا ڕەوتی ئاوەدان‌کردنەوە ‹سازندگی کشور: ئاڤادسازی ولات›.

**سازنده** / sāzande، ـگان/: صفت. ١. پێکهێنەر؛ چێ‌کر؛ سازێنەر؛ داهێنەر؛ وەش‌کەر؛ خۆشکەر؛ سازکەر؛ وەدیهێن؛ بەدیهێن؛ کارساز؛ خاوەن تایبەتمەندی یان توانستی دروست‌کردن ‹نیروهای سازنده: هێزە سازێنەرەکان› ٢. *[مجازی]* کارساز؛ ڕێکهێن؛ بەکەڵک؛ پڕقازانج؛ سازندە؛ وەڕێخەر؛ کارامە و بە بەستە بۆ دروست‌کردن یان دروست‌کردنەوە ‹انتقاد سازنده: ڕەخنەی [illegible]› ٣. *[قدیمی]* سازبەند؛ ژەنیار؛ سازلێدەر؛ سازژەن؛ سازندە؛ سازنە؛ سازوان؛ سازڤان.

**سازواره** / sāzvāre ، ـها/: اسم. ئەنداموەر؛ ژینوەر.

**ساز و آواز** / sāz-o-'āvāz/: اسم. *[گفتاری]* ساز و ئاواز؛ مووسیقا و گۆرانی؛ ئاوازی وێڕای ساز.

**ساز و برگ** / sāz-o-barg/: اسم. باروبنە؛ بارگە؛ بارگەوبنە؛ کەل‌وپەل؛ شت‌ومەکی پێویست بۆ کارێک ‹ساز و برگ سفر: بارگەوبنەی سەفەر›.

**ساز و دهل** / sāz-o-dohol/: اسم. *[مجازی]* ساز و دەوڵ؛ ئەو سازە خۆماڵیانە کە لە جێژن و شاییدا باون (وەکوو زوڕنا، دەوڵ، دایرە) ‹با ساز و دهل از عروس و داماد استقبال کردند: بە ساز و دەوڵەوە پێشوازیان لە بووک و زاوا کرد›.

**ساز و کار** / sāz-o-kār ، ـها/: اسم. ١. ڕێ‌وچار؛ ڕێ‌چار؛ زانیاری یان ڕەوتێک بۆ گەیشتنە ئامانج ‹برای پیشگیری از قاچاق، ساز و کار مؤثری نداریم: بۆ بەرگری لە قاچاخ، ڕێوچارێکی لێهاتوومان نیە› ٢. کار یان چالاکی ماشینی یان ماشین ئاسا ٣. میکانیزم؛ چۆناوچۆنی ڕەوتگەلی بنەمایی فیزیکی یان کیمیایی ناو دیاردەگەل کە دەبێتە هۆی زیچ، کاردانەوە یان دیاردەیەکی‌تر.

**سازه** / sāze ، ـها/: اسم. ١. *[ریاضی]* هۆکار ٢. بنەماییکی پێکهاتوو لە هەندێک پاژگەلی پێکەولکاو بۆ کارێکی تایبەت (وەک پرد، سەکۆی زەویکۆلی و ...).

◘ **مهندسی سازه** ☜ **مهندسی**

**ـ سازی** / sāzî ، ـها/: *پیواژه*. ـ سازی: ١. کاری درووس‌کردن؛ سازکردن ‹راهسازی: ڕێسازی› ٢. کارخانە یان کارگەی بەرهەمهێن ‹کیفسازی: جانتاسازی› ٣. شوێنی چاک‌کردنەوە ‹چراغسازی: چراسازی› ٤. کار و ڕەوتی هەڵبەستن ‹سندسازی: بەڵگەسازی›.

**ساس** / sās ، ـها؛ ـان/: اسم. حەمحەم؛ جووجوو؛ جوجە؛ جووجە؛ پنت؛ پند؛ چنگنە؛ سۆنی؛ ساسی؛ قرنۆ؛ تەختەبینک؛ مێروویەکی خوێن‌مژە بە جەستەی پانی ئاماڵ سوور و بۆنێکی پیسەوە.

◘ **ساس درختی**: مێش‌گەزۆ؛ کیسەڵە؛ سوون؛ جۆرێ لە مێش و مەگەز، شێلەی ڕووەک هەڵدەمژێت و زیانبەخشە.

**ساسات** / sāsāt ، ـها/: [روسی] اسم. ساسات؛ سوپاپ یان ڕۆچنێک لە زارکی کاربراتوردا بۆ کەم‌کردنەوەی هەوا لە کاتی ڕۆشن‌کردنی موتوردا.

**ساسون** / sāsûn, sāson ، ـها/: [روسی] اسم. *[خیاطی]* ساسۆن؛ درزێکی سێ‌گۆشە بۆ کەم‌کردنەوەی فش‌وفۆڵی جلک.

**ساطع** / sāte'/: [عربی] صفت. *[ادبی]* تیشکدەر؛ گەشاوە؛ گەش؛ ڕووناکی‌دەر؛ ڕۆشن‌کەرەوە؛ درەوشان؛ درەوشەر.

**ساطور** / sātûr ، ـها/: [عربی] اسم. جەخار؛ شەتیر؛ چزلک؛ چەپەجاخ؛ چەپەجاغ؛ ساتوور؛ ساتۆرە؛ ساتۆرە؛ ساتۆر؛ ساتۆرک؛ جۆرە کاردێکی دەم‌پان و قورس بۆ شکاندنی پێشە و قرتاندن و هەنجنینی گۆشت و سەوزی: **ساتور**

**ساطوری** / sātûrî/: [عربی] صفت. جنراو؛ هەنجراو؛ ساتووری؛ کوتراو و وردکراو بە ساتۆر: **ساتوری**

**ساعات** /sā'āt/: [عربی] جمعِ ☜ **ساعَت**

**ساعت** /sā'at/: [عربی]/اسم. کاتژمێر؛ دەمژمێر؛ گووسک؛ سەعات: ١. /ـها/ سەعاتە؛ کەرەسەیەک بۆ پێوانی زەمان و دیاریکردنی کات ٢. کاتێ کە بە هۆی ئەو کەرەسەیە پیشان دەدرێ ‹ساعت هشت است: کاتژمێر هەشتە› ٣. /ـها؛ ساعات/ یەکەی پێوانی کات کە بەو کەرەسەیە دەپێورێ، بەرانبەری ١/٢٤ شەو و ڕۆژ ‹قطار دو ساعت بعد حرکت می‌کند: قەتار دوو کاتژمێری‌تر دەڕوا› ٤. /نجوم/ وێنەیەکی گەردوونی لە ئاسمانی لەتەگۆی باشووری ڕۆژهەلاتی ئەستێرەی ئاخیرونەهردا.

▣ **ساعت آبی**: کاتژمێری ئاوی؛ هەر یەکە لە کەرەسەگەلی جۆراوجۆر، بریتی لە دەفرێک بە کونێکی بچووک لە ژێرەوە کە بە خالی یان پڕ بوونەوەی دەفرەکە تێپەڕینی کات دیاری دەکرێ: **پَنگان** /قدیمی/

**ساعت آفتابی**: کاتژمێری هەتاوی؛ پەڕەیەکی پلەکدار کە بە سەریەوە میلەیەک بە گۆشەیەکی دیاریکراوەوە دانراوە و بە دانانی لە بەرانبەر تیشکی خۆر و کورت و درێژ بوونەوەی سێبەری میلەکە کات دەزانرێ: **شاخص**

**ساعت اتمی**: کاتژمێری ئەتومی؛ کاتژمێری ناوکەیی؛ سەعاتێ کە بە بزواندنی ئەتوم یان مولکوول کار دەکا.

**ساعت الکترونی**: کاتژمێری ئەلکترۆنی؛ ساعەتێ کە بە بزواندنی ئیلێکترون کار دەکا.

**ساعت برقی**: کاتژمێری کارەبایی/ بەرقی؛ کاتژمێرێک کە موتورەکەی بە هۆی هێزی بەرقەوە کار دەکا. هەروەها: **ساعت باتری‌دار**

**ساعت بغلی**: سەعاتی باخەڵی؛ کاتژمێری باخەڵی؛ سەعات گیرفانی؛ کاتژمێری گچکەی پتر قاپ و زنجیردار کە دە باخەڵ (کەوا یان سەڵتە)دا قایم دەکرێ: **ساعت جیبی**

**ساعت به ساعت**: /مجازی/ دەم‌بەدەم؛ دەماودەم؛ سات بە سات؛ ساتەوسات؛ پەیتا ـ پەیتا؛ لە هەر سەعاتدا ‹ساعت به ساعت حالش بدتر می‌شد: دەم‌بەدەم حالی خراپتر دەبوو›.

**ساعت جیبی** ☜ **ساعت بغلی**

**ساعت خودکار**: کاتژمێری خۆکار؛ کاتژمێری خۆمەش؛ سەعاتێ کە پێویستی بە کۆک‌کردن نیە.

**ساعت دیجیتالی**: کاتژمێری دیجیتاڵی؛ کاتژمێرێک کە کات بە ژمارە پیشان دەدا: **ساعت کامپیوتری**

**ساعت دیواری**: کاتژمێری دیواری؛ سەعات دیواری؛ کاتژمێرێک بە پەڕەیەکی پان و گەورەوە کە بە دیواردا هەڵدەواسرێ.

**ساعت رملی** ☜ **ساعت شنی**

**ساعت رومیزی**: کاتژمێری سەرمێزی؛ سەعاتێکی پایەدار کە لە سەر مێز دادەنرێ.

**ساعت شماطه‌دار**: کاتژمێری زەنگی؛ کاتژمێرێک کە لە کاتی دیاریکراودا زەنگ لێ‌دەدا.

**ساعت شنی**: کاتژمێری ماسەیی؛ سەعات رملی؛ کاتژمێرێ کە بە پێی داڕژانی زیخ لە نێوان ڕۆچنەی دەفرێکی شووشەئاساوە بۆ ناو دەفرێکی‌تری هاودەقی، زەمان دەپێوێ: **پَنگان**

**ساعت فیزیولژیک**: کاتژمێری فیزیولۆژیک؛ پێکهاتەیەکی تایبەت لە گیاندارانـدا کە لە کاتێکی دیاریکراوی شەو و ڕۆژ، دەبێتە هۆی کاردانەوەیەکی تایبەت (وەک پشکووتنی بڕێک گوڵ لە خۆراوا و لە خەو هەستانی مرۆ لە کاتێکی دیاریدا، ...).

**ساعت کار**: کاتی کار؛ کاتێ کە کەسێ یان ڕێکخراوەیەک لەو کاتەدا کار دەکا.

**ساعت کامپیوتری** ☜ **ساعت دیجیتالی**

**ساعت کوارتز**: کاتژمێری کوارتز؛ سەعاتێک کە بە هاتوچۆی ئیلێکترۆن لە نێو بلۆری کوارتزدا دەگەڕێ.

**ساعت گردنی**: کاتژمێری ملوانکەیی؛ سەعاتێ کە وەک ملوانکە؛ دەکرێتە ملەوە.

**ساعت مچی**: کاتژمێری دەستی؛ سەعات دەسی؛ کاتژمێرێ کە بە مەچەکی دەستەوە دەبەسترێ.

**ساعت هفته کوک**: هەفتەکۆک؛ هەفتۆک؛ سەعاتێ کە بە حەو ڕۆژ جارێ کرژ دەکرێتەوە.

**ساعتساز** / sā'atsāz ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. سەعاتساز؛ ئەو کەسە کاری چاکردنەوەی سەعاتە.

**ساعتسازی** / sā'atsāzî/: [عربی/ فارسی]/اسم. سەعاتسازی: ١. خستنەوە کاری سەعاتی لەکارکەوتوو ٢. کاری سەعاتساز ٣. /ـها/ کارگەی سەعاتسازی ٤. /ـها/ کارخانەی بەرهەم هێنانی سەعات ٥. کاری چێکرنی سەعات.

**ساعت شمار** / sā'atšomār/: [عربی/ فارسی]/اسم. کاتبژێر؛ کاتژمێر؛ عەقرەبەیێ بەسەر ڕووپەڕی سەعاتەوە کە سەعات بە پێی کات نیشان دەدا.

**ساعت شماری** / sā'atšomārî/: [عربی/ فارسی] اسم. [مجازی] چاوەڕوانی؛ تەمای بێهەودا.

⊡ **ساعتشماری کردن**: بێئۆقرە بوون؛ چاوەڕوانی کردن؛ زۆر چاوەڕوان بوون ‹برای آمدن پسرش ساعتشماری می‌کرد: بۆ هاتنەوەی کوڕەکەی بێ ئۆقرە ببوو›.

**ساعتگرد** / sā'atgard/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕاسپێچ؛ بە سووڕانەوە لە باری عەقرەبەی سەعات (لە چەپەوە بۆ ڕاست).

ـــ **ساعته** / sā'ate/: [عربی] پیواژە. سەعاتە: ١. سەعاتی؛ بە سەعات؛ پێوەندیدار بە ماوەی کاتی بە پێی ساعەتەوە ‹دوساعته: دووسەعاتە› ٢. بە تەمەن یان دەوام بە پێی سەعات ‹دوساعته رفت و برگشت: دووسەعاتە چوو و هاتەوە›.

**ساعتی**[1] / sā'atî/: [عربی] صفت. سەعاتی: ١. بە تایبەتمەندی ڕێک کردن یان بژاردن بە پێی سەعات ‹بمب ساعتی: بومبی سەعاتی› ٢. ☜ گل ساعتی، **گل**

**ساعتی**[2]: قید. ١. هەر سەعاتێک؛ بە سەعات؛ بە پێ یا بەرامبەری هەر کاتژمێرێک ‹ساعتی پنجاه تومان می‌گرفت: هەر سەعاتێک پەنجا تمەنی وەردەگرت› ٢. سەعاتێ؛ سەعاتێک؛ ساعەتێوە؛ کاتژمێرێک؛ لە هەر کاتژمێرێکدا ‹ساعتی یک صفحه می‌نوشت: سەعاتێک لاپەڕەیەکی دەنووسی›.

**ساعد** / sā'ed ، ـها/: [عربی]/اسم. مەچەک؛ زەند؛ ساکول؛ هەژگ؛ ساقۆڵ؛ باسک؛ گورمرک؛ ئەو بەشە لە دەست کە لە نێوان جومگە و ئانیشکدایە.

**ساعی** / sā'î/: [عربی] صفت. [ادبی] کۆشا؛ تێکۆشەر؛ ڕەنجدەر؛ تەقالادەر؛ هەوڵدەر ‹دانش‌آموز ساعی حتماً موفق می‌شود: قوتابی کۆشا بێ‌گومان سەردەکەوێ›.

**ساغر** / sāqar ، ـها/: اسم. [ادبی] گێلاس؛ گێلاس؛ پیالە؛ یالە؛ جام؛ جامی شەراب؛ دەفرێ کە شەرابی پێ دەخۆنەوە.

**ساغری** / sāqarî/: [معرب از ترکی] ☜ چرم ساغری، **چرم**

**سافتبال** / sāftbāl/: [انگلیسی]/اسم. سافتباڵ؛ یاریەکی وەکوو بەیسباڵ کە لە زەوینێکی بچووکتر و بە تۆپێکی گەورەتر دەکرێ.

**ساق** / sāq ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. بەلەک؛ پووز؛ پویز؛ پیز؛ پووزی؛ لەتەر؛ لینگ؛ گاللۆر؛ گیتر؛ گیتک؛ هەژگ؛ هێت؛ قاچ؛ چیم؛ زەبلک؛ پل؛ قرقرک؛ بەشێکی پێ لە نێوان قولەقاپە و ئەژنۆ: **ساق پا** ٢. [گفتاری] لاسک؛ لاسکە؛ ساقەتە ٣. پووزەوانە؛ مل؛ ملە؛ ئەو بەشە لە پووتین و گۆرەوا کە پووز دادەپۆشێ ٤. قۆلوانە؛ قۆلەوانە؛

بەشێک لە دەستکێش کە باسک دادەپۆشێ.
▣ **ساق پا** ☜ **ساق ـ۱**
**ساق دست:** *[گفتاری]* باسک؛ مەچەک؛ قۆڵ؛ ساقۆڵ؛ زەند؛ نێوان جومگە و ئانیشک.
**ساق عروس** ☜ **ساق‌عروس**
**ساق‌بلند** / sāqboland/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ملکەبەرز؛ ملکەبڵند؛ ملکەدرێژ ‹جوراب ساق‌بلند: گۆرەویی ملکەبەرز›: **ساقه بلند**. هەروەها: **ساق کوتاه**
**ساق‌بند** / sāqband/: [عربی/ فارسی] ☜ **ساق‌پیچ**
**ساق‌پیچ** / sāqpîč، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* زەرگاڵ؛ زەنگاڵ؛ بەلەک پێچ؛ ساق پێچ؛ پلپیز؛ پووزەوان؛ پووزەوانە؛ پۆزەوانە: **ساق‌بند**
**ساقدست** / sāqdast، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* قۆڵەوانە؛ قۆڵوانە؛ سۆرانی؛ فەقیانە؛ پۆشەنێک بۆ سەر باسک.
**ساقدوش** / sāqdûš، ـها/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* شۆشبان؛ برازاوا؛ برازاڤا؛ برازەما؛ پیاوێ لە خێڵی زاوا کە لە کاتی زماوەندا لە پەنای زاوا دادەنیشێ و ڕێنوێنی دەکا.
▣ **ساقدوش عروس**: پاخەسوو؛ بەربووک؛ بەربیک؛ بەربوو؛ بەربووی؛ پاوەیوە؛ ژنێک کە دەگەڵ بووک دەکەوێ و ڕێنوێنی دەکا.
**ساق‌زر** / sāqzar/: [عربی/ فارسی] *صفت. [گیاه‌شناسی]* گۆچانەزێڕینە؛ گیایێکی قیت بە گەڵای درێژۆکەی وەک ڕم، گوڵی ورد و زەردەوە، ماکێکی سابوونی لێ دەردێنن کە بۆ مەبەستی بژیشکی (پاک‌کردنەوەی خوێن و دەرمانی گرفتی میز کردن) بە کار دێت.
**ساق‌شلواری** / sāqšalvārî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* پاپۆشێکی ژنانەیە کە تا قولەپێ دادەپۆشێ.
**ساقط** / sāqet/: [عربی] *صفت.* لەکارتە؛ کەتی؛ سەقەت؛ سەکت؛ لاکەوتە؛ لاکەوتوو؛ قەرت؛ قەرەت؛ داکەوتوو؛ داکەوتە؛ ڕووخاو؛ ڕماو؛ تەپیو؛ تەپاو.
▣ **ساقط شدن**: ۱. داکەوتن؛ داکەفتن؛ هاتنە خوار؛ کەفتنە خوارەوە؛ ئەرەکەوتەی؛ کەوتەیرە؛ دارمان؛ ڕمیان؛ داتەپان؛ ڕووخان؛ ئەرەتەپەی؛ تەپایرە؛ وڕەی؛ وڕای؛ ئەرەوڕەی؛ وڕایرە؛ سەقەت بوون ‹بخشی از سقف بر اثر زلزله ساقط شد: لایەک لە میچکە بە هۆی بوومەلەرزەوە داکەوت› ۲. دابڕ بوون؛ کەل بوون؛ کەوتنە لا؛ داتەکین؛ بێ‌بەش بوون ‹از هستی ساقط شدن: لە ژین دابڕ بوون› ۳. هەڵپێچیان؛ وەلانران؛ باو نەمان؛ بێ‌بڕ بوون؛ وەلا خران ‹دولت ساقط شد: دەوڵەت هەڵپێچرا› ٤. داکەوتن؛ کەوتەیرە؛ سەقەت بوون؛ نەمان؛ جێمان یان لەبیر چوون ‹چند کلمه از این جمله ساقط شده است: چەند وشە لەم ڕستەیە داکەوتووە› ٥. سەکتین؛ مردار بوونەوە.
**ساقط کردن**: داخستن؛ هەڵپێچاندن؛ لابردن؛ سەقەت کردن.
**ساق‌عروس** / sāq(e)'arûs/: [عربی] *اسم.* ساقەعرووس؛ جۆرەشیرنیەکی باریکی لوول‌کراو لە ئارد، هێلکە، کەرە و گوڵاو کە ناوەکەی لە شەکر و بادام ئاخنراوە و خاکەقەندی پێدا کراوە.
**ساق و سالم** / sāq-o-sālem/: [ترکی/ عربی] *صفت. [گفتاری]* ساغ و سەلامەت؛ ساق‌وسەلیم؛ ساغ و سلامەت؛ ساق‌وسالم: ۱. زیت و زەلام؛ لەش‌ساق ‹رفتم دیدم ساق و سالم نشسته است: ڕۆیشتم دیتم ساغ و سەلامەت دانیشتووە› ۲. بێ‌خەوش؛ بێ‌کەم و کووڕی ‹من ظرفها را ساق و سالم تحویلت دادم: من دەفرەکانم ساق و سەلیم پێ دای›.
**ساقه** / sāqe، ـها/: [عربی] *اسم.* لاسک؛ نێرتک؛ نێرک؛ لاچک؛ قاسک؛ چڵ؛ قل؛ تل؛ قلەگیا؛ ساقەتە؛ قەد؛ قەف؛ قەسەڵ: ۱. تەوەرەی سەرەکی بە هەوادا هەڵچووی گیاگەلی ئاوخۆرەیی ئاوەندی کە گەڵا و چووزە و

ئەندامانی زا و زێی (گوڵ) هەڵدەگرێ ٢. هەر پێکهاتەیەکی لاسکئاسا ‹ساقەی مغز: لاسکی مەژی›.

▣ ساقەی بالارونـدە: لاسکی هەڵچۆ؛ لاسکی پێهەڵگەڕ؛ لاسکی نەرم و لاواز کە بە شتێکدا هەڵدەچێ (وەک لاسکی مێو): **ساقەی روندە**

ساقەی پیچندە: لاسکی هەڵپێچ؛ لاسکێ کە لە هەڵچووندا، بە دەوری گیا و داریتـرەوە دەئاڵێ (وەکوو لاسکی لیلووپەڕ).

ساقەی خزنـدە: تەرزکێش؛ لاسکی خزۆک؛ تەرز؛ قەدی خشۆک؛ لاسکی هەندێ لە رووەکان کە بە سەر خاکدا دەکشێ و لاسکێ نوێ هەڵدەدا (وەکوو لاسکی تووە فەرەنگی).

ساقەی روندە ☜ **ساقەی بالاروندە**

ساقەی زیرزمینی: لاسکی بنبوومی؛ لاسکی ژێرزەوی؛ لاسکێ کە بە بن زەویدا دەڕوا و بەبێ تاوی خۆر گەشە دەکا.

ساقەی غدەای: لاسکی سەلکی؛ لاسکە پیازۆکە؛ لاسکی ژێرزەوینی کە وەک لک هەڵدەماسێ (وەک لاسکی سێبنەرد).

ساقەی غلـە: کلۆش؛ کورۆش؛ کولەش؛ قەرەش؛ پیزڵ؛ سەریت؛ قرچە؛ قەزەب؛ لاسکی خەلە.

ساقەی کاوک: پیک؛ قاقۆ؛ قەڵەتوورک؛ قالۆرە؛ قالۆر؛ لاسکی کلۆری گیا.

ساقەی گوشتی: لاسکی گۆشتی؛ لاسکی هەڵچۆی ئەستوور و ئاودار کە لە برێ جۆردا گەڵاکانی بۆتە دڕوو (وەک لاسکی کاکتووس).

ساقەی ماشورەای: لاسکی پیک؛ لاسکی گرێ-گرێ و هلۆل (وەک گەنم): **ماشورە**

ساقەی مغز: لاسکی مەژی؛ ساقەتەی مێشک.

ساقەی هوایی: لاسکی هەوایی؛ لاسکی هەڵچۆ؛ لاسکێ کە لە دەرەوەی خاک و بە کەڵک وەرگرتن لە تیشکی هەتاو گەشە دەکا.

**ساقە آغوش** / sāqe'āqûš/: [عربی/ فارسی]/اسم. گەڵاگەڵێ کە ڕاستەوخۆ بە لاسکەوە لکاون.

**ساقەبلند** / sāqeboland/: [عربی/ فارسی] ☜ **ساقبلند**

**ساقەپر** / sāqepar/: [عربی/ فارسی]/اسم. قەدی پەڕ؛ لاسکی پەڕ؛ قەڵەمی پەڕ؛ بەشی بنەوەی پەڕی باڵندە.

**ساقە چە** / sāqeče/: [عربی/ فارسی]/اسم. چووزە؛ توزە؛ چووزەرە؛ چوێزەرە؛ چوویزەرە؛ چووزەڵە؛ تووز؛ تووزرە؛ چەکەرە؛ چەقەرە؛ چووقرە؛ لاسکی سەرەتایی و ناسکی گیا کە ساقەتەی سەرەکی لێ ئەروێ.

**ساقی** / sāqî ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. [ادبی] مەیگێڕ؛ مەیگەر؛ ساقی؛ کەسێ کە شەراب لە ناو شەراوخۆراندا دەگەڕێنێ.

**ساقیگری** / sāqîgarî/: [عربی/ فارسی]/اسم. ساقیگەری؛ بادەگێڕی؛ کاری مەیگێڕی.

**ساقینامە** / sāqînāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. [ادبی] ساقینامە؛ مەسنەویەک لە بەحری موتەقاریبدا کە تێیدا شاعیر رووی قسەی لە مەیگێڕە و بە مەراش و بەلاش زانینی دنیا، هانی دەدا بادەکەی بگێڕێ.

**ساک** / sāk ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ١. ساک؛ چیمانی؛ چەنتە؛ چەنتک؛ هەگبە؛ جانتا؛ چەنتەی سەفەر؛ کەرەسەیێکی وەک کیسە و بەندار، زۆرتر لە چەرم، پلاستیک یان برێزێنت کە تێشوو و کەلوپەلی پێویستی تێدەنێن و بە دەست هەڵیدەگرن ‹ساک را با خودت بیاور: ساکەکە لەگەڵ خۆت بێنە› ٢. **آش ساک، آش**

▣ **ساک بچە**: جانتای ساوا؛ ساکی ساوا؛ جۆرێک لانک، لە بیچمی جانتا، بۆ هەڵگرتنی منداڵی ساوا.

**ساکارات** / sākārāt/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] ساکارات؛ ئاوێتەیەک لە ساکارید و ژەنگێکی کانزایی.

**ســاکارز** / sākāroz/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] ساکاروز؛ شەکری چەوەندەر و قامیشی شەکر؛ قەنێکی بلۆرێنی بێڕەنگ و شیرینە کە لە ئاو و هێندێک ئەلکولدا دەتوێتەوە و لە شیرین‌کردنی چێشت و دەرمانسازی و چێ‌کردنی تەقەمەنیدا بە کەڵک دێ.

**ساکارومیست** / sākāromîst ، ـها/: [فرانسوی] اسم. [زیست‌شناسی] ساکارومیست؛ ڕەگەزێ لە کارگی کیسەیی (ئاسکویت)، کە لە هەویرترشی نان و هەوێنی شەراودا وەکوو ترشێنەر بە کار دێ.

**ســاکارید** / sākārîd/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] لێکدراوی بازێکی ئالی و قەن (وەک کازئین ساکارید).

**ساکارین** / sākārîn/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] ماکێکی سپی بلوورین کە لە ئاودا دەتوێتەوە و ٤٠٠ ئەوندەی شەکر شیرینە و لە جێی شەکر بە کار دەبرێ: **ساخارین**

**ساکت** / sāket/: صفت. ١. بێ‌دەنگ؛ کپ؛ کش؛ خپ؛ مات؛ کژ و مات؛ قەرەقپ؛ بێ‌هەرا؛ نەملچ؛ کڕ؛ نووژ؛ وست؛ وس؛ بێ‌دەنگ و دۆ ‹ساکت باش و دیگر حرف نزن!: بێ‌دەنگ بە و چیدی قسە مەکە!› ٢. هێور؛ ئارام؛ دامرکاو؛ هێدی؛ هێمن ‹درد ساکت شد: ئێشەکە هێور بووەوە›. هەروەها: **ساکت بودن؛ ساکت‌شدن؛ ساکت کردن**

**ساکسوفن** / sāksofon ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ساکسیفون؛ سازێکی بازەنی وەک سوڕنایە کە بە دوگمەکانی نۆتگەلی موسیقا دەژەنرێ: **ساکسیفون**

**ساکسیفون** / sāksîfon/: [از فرانسوی] ☜ **ساکسُوفُون**

**ساکن** / sāken/: [عربی] صفت. ١. /ـان؛ ـین؛ سَکَنه/ دانیشتوو؛ ئادار؛ نیشتەجێ ‹ساکن سنندج: دانیشتووی سنە› ٢. مەند؛ مەن؛ نەجم؛ نەجووڵ؛ بێ‌خوست؛ نەبزۆک. هەروەها: **ساکن بودن؛ ساکن شدن؛ ساکن کردن**

**ساکول** / sākûl ، ـها/: [؟]/اسم. [کالبدشناسی] ساکوول؛ یەکێ لە دوو کیسەی پێکەوەلکاوی گوێی ناوین (ئەوی‌تریان ئەتریکوول) کە سەرچاوەی ئەندامی بیستنە.

**ساکی** / sākî/: [انگلیسی از ژاپنی]/اسم. ساکی؛ ناوی خواردنەوەی ئەلکولی ژاپونە کە لە گەڕانەوەی ئارەقی برنج بە دەست دێ: **عرق برنج**

**سال**[1] / sāl ، ـها؛ ـیان/: /اسم. ساڵ؛ ساڵە: ١. یەکەی پێوانی زەمان بەرانبەر بە سووڕێکی زەوی بە دەوری خۆردا، کە بریتیە لە سێسەد و شەست و پێنج شەو و ڕۆژ و نزیک پێنج ساعەت و چل و نۆ خولەک (ساڵی هەتاوی) ٢. یەکەی پێوانی زەمان بەرانبەر دوازدەجار خولی مانگ بە دەوری زەویدا، کە بریتیە لە سێسەد و پەنجا و چوار ڕۆژ (ساڵی مانگی) ٣. تەمەن؛ یەکەی پێوانی ژیانی کەسێ یان شتێک ‹چند سال دارید؟: چەند ساڵتانە؟› ٤. بەروار؛ مێژوو؛ زەمانی ڕووداوێک بە پێی سەرەتایەکی مێژوو ‹انقلاب مشروطه در سال ١٣٢۴ قمری روی داد: ڕاپەڕینی مەشرووتە لە ساڵی ١٣٢٤ی مانگیدا رووی دا› ٥. خولێکی چالاکی دامەزراوەیەک لە درێژایی ساڵێکدا ‹سال تحصیلی: ساڵی خوێندن› ٦. پۆل؛ پلەک یان پایەی قوتابی یان خوێندکار لە دامەزراوەیەکی فێرکاریدا ‹سال اول فلسفه: ساڵی هەوەڵی فەلسەفە› ٧. سەرجەمی ژمارەگەلی گۆڤار یان ڕۆژنامەیەک لە مەودای ساڵێکدا ٨. [مجازی] ساڵڕۆژ؛ ساڵهات؛ ساڵەهات؛ ڕۆژێ کە یەک یان چەند ساڵێ لەوەپێش ڕووداوێکی تێدا ڕووی داوە ‹فردا سال پدرمان است: بەیانی ساڵی بابمانە›.

▣ **سال اعتدالی** ☜ **سال خورشیدی/ شمسی**

**سال به دوازده ماه:** ساڵی دوازدەماه ☜ **سالی**

**ســال بــه ســال:** ساڵ‌بەساڵ؛ ساڵ‌وەساڵ؛

ساڵەوساڵ؛ ساڵ لەبەر ساڵ؛ ساڵ لە دوای یەک؛ هەرساڵ؛ هەمووساڵێ؛ هەر چی ساڵە ‹سال‌به‌سال حالش بهتر می‌شد: ساڵ‌بەساڵ حاڵی باشتر دەبوو›.

**سال تا سال:** ساڵ بۆ ساڵ؛ ساڵ تا ساڵ؛ ساڵ هەتا ساڵ؛ ساڵەوساڵ؛ لەماوەی ساڵدا؛ ئەم ساڵ بۆ ئەو ساڵ ‹سال‌تاسال رنگ حمام را نمی‌بیند: ساڵ بۆ ساڵ چاوی بە گەرماو ناکەوێ›.

**سال تحصیلی:** ساڵی خوێندن؛ ماوەیەک (بەرامبەری ۹ مانگ) لە ساڵدا کە دەزگایەکی فێریاری کار دەکا.

**سال جاری:** ئەوساڵ؛ ئیمساڵ؛ ئەمساڵ؛ ئەڤساڵ؛ ئێساڵ.

**سال خورشیدی/ شمسی:** ساڵی هەتاوی؛ ساڵی ڕۆژی؛ مەودای دووبگاری ڕواڵەتی لەشوێن‌یەکی خۆر لە خاڵی بەهاریەوە (بەرانبەری ۳٦٥ ڕۆژ و ٥ سەعات و ٤٨ خولەک و ٤٦ چرکە): **سال اعتدالی**

**سال قمری:** ساڵی مانگی؛ ساڵی هەیڤی؛ مەودای زەمانی دوازدە جار گەڕانی دوا بە دوای مانگ بە دەوری زەویدا (نزیک بە ۳٥٤ ڕۆژ).

**سال کبیسه:** ساڵی کەبیسە؛ ساڵی پڕ؛ ساڵێ کە ڕەشەمەی سی‌ڕۆژ بێ؛ ساڵی ۳٦٦ ڕۆژە.

**سال مالی:** ساڵی ماڵی؛ دوازدە مانگی پەساپەس لە سەرەتایەکی دڵخوازەوە کە بۆ خولێکی حیسابداری ڕەچاو دەکرێ.

**سال میلادی:** ساڵی زایینی؛ ساڵی هەتاوی کە لە سەرەتای ژانویەوە (۱۱ی بەفرانبار) دەست پێ‌دەکات.

**سال نجومی:** ساڵی ئەستێرەیی؛ مەودای زەمانی دوو بواری دوا بە دوای زەوین لە شوێنێکی گریمانەیی دیاریکراو لە ئاسماندا (بەرانبەر بە ۳٦٥ ڕۆژ، ٦ ساعەت، ۹ خولەک و ۱٥ چرکە).

**سال نوری:** ساڵی نووری؛ مەودایەک کە نوور لە ماوەی یەکساڵدا دەیپێوێ (مەودایەکی یەکجار درێژ بەرامبەر بە $9{,}461 \times 10^{12}$ کیلۆمیتر).

**سالهای سال:** ساڵانی ساڵ؛ چەنای چەن‌ساڵ؛ ساڵەهای‌ساڵ؛ زۆرساڵان؛ ساڵانی زۆر؛ ساڵهاتی ساڵ؛ ماوەیەکی درێژ ‹سالهای سال است که به آنجا نرفته‌ام: ساڵانی ساڵە نەچوومەتە ئەوێ›.

**سال هجری خورشیدی:** ساڵی کۆچی‌هەتاوی؛ ساڵی ئێرانی کە ڕۆژی ئەوەڵی نەورۆز (خاکەلێوە) دەس پێ‌دەکا.

**سال هجری قمری:** ساڵی کۆچی‌مانگی؛ ساڵی هەیڤی ئیسلامی کە لە هەوەڵی موحەڕڕەمەوە دەس پێدەکات.

▣ **سال کسی بودن:** *[مجازی]* ساڵی کەسێک بوون؛ ساڵهاتی مەرگی کەسێک بوون؛ ساڵڕۆژی مردنی کەسێ بوون.

**سال کسی را گرفتن:** *[مجازی]* ساڵ نیان بۆ کەسێک؛ ساڵ بۆ کەسێ گرتن؛ گرتنی ساڵڕۆژی مردنی کەسێک.

**ـ سال**[2]**:** *پیوازە.* ــ ساڵ: ۱. بە تایبەتمەندی تەمەنێکی دیاریکراو ‹بزرگسال: گەورەساڵ› ۲. ساڵێک بە تایبەتمەندییەکی دیارەوە‹آبسال: تەڕەساڵ›.

**سالاد / sālād ، ـها/:** [فرانسوی]*/اسم.* سالاد؛ زەڵاتە؛ سڵپاتە؛ ئاوێتەیەک لە سەوزی، دانەوێڵە، گۆشت یان هێلکە و ... کە بە ساردی و وێرای خواردەمەنی‌تر دەخورێ.

▣ **سالاد الویه:** سالادی ئولوڤیە؛ زەڵاتەیێ کە لە سێفەزەمینە، هێلکەی کوڵاو، گۆشتی مریشک، گێزەر، نۆکەفەرەنگی و خەیارشۆری وردکراو و سۆسی تایبەت دروست دەکرێ.

**سالاد فصل:** سالادی وەرز؛ زەڵاتەی وەرزی؛ تێکەڵاوێ لە سەوزی و مایەی سالادی

شیاوی وەرز.

**سالادخوری** / sālādxorî ، ـھا/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. سالادخۆری؛ دەفری تایبەتی زەڵاتە دانان لە سەر سفرە.

**سالادی** / sālādî/: [فرانسوی] *صفت.* زەڵاتەیی؛ سالادی؛ شیاو بۆ کردنە زەڵاتە ‹خیار سالادی: خەیاری زەڵاتەیی›.

**سالار**[1] / sālār ، ـھا؛ ـان/: *اسم. [ادبی]* سەرۆک؛ سەردار؛ سەرکردە؛ سالار؛ یەکمان؛ گەورەی کۆمەڵ ‹سالار لشکر: سەرۆکی لەشکەر›.

**سالار**[2]: *صفت.* مەزن؛ مازن؛ میر؛ سالار؛ خاوەن خو و خدەی بەرز و هەڤیاز ‹مرد سالاری است: پیاوێکی مەزنە›.

**سالاری** / sālārî/: *اسم.* سالاری؛ سەرۆکایەتی؛ سەرکردەیی؛ میری؛ مەزنی ‹اشراف سالاری: خان سالاری›.

**سالامبور** / sālāmbor/: [؟]*اسم.* سالامبور؛ پێستەی هەڵاڵدراوی چوارپێیان کە کوڵک و چەوری لێ سڕاوەتەوە و ئامادەی دەباغیە.

**سالانه**[1] / sālāne/: *صفت.* سالیانە؛ سالانە؛ سالین؛ سالکی: ١. پێوەندیدار و بەندیوار بە سالێکەوە ‹محصول سالانە: بەرهەمی سالیانە› ٢. پێوەندیدار و بەندیوار بە سالەوە ‹رویدادهای سالانە: رووداوگەلی سالیانە› ❊ **سالیانه**

**سالانه**[2]: *قید.* سالێ؛ سالێک؛ لەسالدا؛ سالانە؛ لە سالێونە؛ لە ماوەی سالێکدا ‹سالانه چهار بار به اروپا می‌رود: سالێ چوار جار دەچێتە ئورووپا›: **سالیانه**

**سال تحویل** / sāltahvîl/: [فارسی/ عربی] ☜ تحویلِ سال، **تحویل**

**سالخورده** / sālxorde ، ـھا؛ ـگان/: *صفت. [مجازی]* بە ساڵداچوو؛ بە تەمەن؛ بە سالاچوو؛ ساڵدار؛ دانساڵ: ١. *[ادبی]* کۆن؛ کەون؛ کەڤنار؛ کەونار؛ کۆنەساڵ؛ پیر؛ پیرۆک؛ پیرەک؛ مێر؛ میرِ؛ قەدیمی؛ گەورە؛ تەمەن ڕۆیشتوو؛ خاوەن تەمەنی زۆر ‹درخت سالخورده: داری بە ساڵدا چوو› ٢. کاڵ (بۆ پیاو)؛ ساڵبۆری؛ کۆنساڵ؛ ڕەندۆڵ؛ ئیختیار؛ زۆرهان؛ خاوەن تەمەنی لە ٦٠ ساڵ بەرەو سەر (لە مرۆڤدا) ‹مرد سالخورده: پیاوی بە ساڵدا چوو›. هەروەها: **سالخوردگی**

**سالدات** / sāldāt ، ـھا/: [روسی از ایتالیایی]/*اسم.* سالدات؛ سەربازی رووس.

**سالروز** / sālrûz/: *اسم.* سالڕۆژ؛ سالەهات؛ سالهات؛ ڕۆژێ کە یەک یان چەند ساڵی پێش ڕووداوێکی تێدا ڕووی داوە ‹سالروز تولد: سالڕۆژی لە دایک بوون›.

**سالشمار** / sālšomār/: *اسم.* ساڵژمێر؛ ساڵبژێر؛ ئەوەی (بەتایبەت نووسراوە) کە لەمەڕ ڕووداوگەلێکی هەڵبژێردراو لە هەر ساڵدا ئاگاداری دەدا ‹سالشمار زندگی دهخدا: ساڵژمیری ژیانی دیهخودا›.

**سالشماری** / sālšomārî/ ☜ **تقویم ـ٢**

**سالک** / sālak/: *اسم.* ١. نەخۆشینێکی پێستی بە شێوەی زامێکی گەورەی چڵکین لە سەر دەموچاو، کە بە هۆی پێوەدانی مێشوولەی خاکی تووشی مرۆ دەبێ ٢. شوێنی ئەو زامە.

**سالک** / sālek ، ـان/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* ١. ڕێڕۆ؛ ڕێڕەو؛ ڕێوەند؛ ڕێڤنگ؛ ڕێڤنگی؛ ئەوەی ڕێیەک دەگرێتە بەر، بەتایبەت ئەوی لە کەس یان ئارمانێک پەیڕەوی دەکا ٢. *[تصوف]* ئەو کەسەی پلەکانی عیرفانی بە ڕێنوێنی پیرێک دەپێوێ.

**سالگرد** / sālgard/: *اسم.* ساڵەهات؛ ساڵهات؛ ساڵوەگەڕ؛ ساڵبڕ؛ ساڵڤەگەڕ؛ زەمانێ کە یەک یان چەند ساڵ لە ڕووداوێک تێپەڕیوە ‹سالگرد مرگ پدربزرگ: ساڵوەگەری مەرگی باپیر›.

**سالم** / sālem/: [عربی] *صفت.* ١. ساق؛ ساخ؛ ساغ؛ سالم؛ وەش؛ واش؛ سلامەت؛ تەندرووس ‹انسان سالم: مرۆی ساق› ٢. خاوێن؛ پاک؛ پاکژ؛ پاقژ؛ بژون؛ دوور لە پیسی و خراپی ‹آب سالم: ئاوی خاوێن› ٣. *[مجازی]* پاک؛ خاوەن ئاکاری

چاک و گونجاو ‹جوان سالم است: لاوێکی پاک›.

**سالم‌سازی** / sālemsāzî/: [عربی/ فارسی]/اسم. پاکژکاری؛ کار و ڕەوتی پاکژکردنەوە؛ خاوێن کردنەوە؛ لە بەین بردنی ئەو هۆیانەی کە نەخۆشی ساز دەکەن ‹سالم‌سازی آب: پاکژکاری ئاو›.

**سالمند** / sālmand، ـها؛ ـان/: صفت. ۱. زۆرهان؛ کۆنەساڵ؛ بە ساڵداچوو؛ دانساڵ ۲. پیر؛ خاوەن تەمەنی ۵۰ تا ۶۰ ساڵ (لە مرۆدا).

**سالمندسالاری** / sālmandsālārî/: اسم. پیرمەزنی؛ پیرسالاری؛ سیستەمێکی کۆمەڵایەتی- ڕامیاری یان کارگێڕی کە لە لایەن پیر و کاڵانەوە بە ڕێوە دەبرێ.

**سالمندشناسی** / sālmandšenāsî/: اسم. پیرناسی؛ لقێک لە زانستی بژیشکی سەبارەت بە پێکهاتنی نەخۆشینگەلی پیران و ڕێگەی چارەسەرکردنیان و چۆنیەتی خواردن و پاراستنیان: **پیری‌شناسی**

**سالن** / sālon، ـها/: [فرانسوی از ایتالیایی]/اسم. سالۆن؛ تالار؛ هۆڵ؛ هۆدەی گەورە؛ دیوێ کە زۆر کەس دەدیرێ.

▣ سالن ترانزیت: تالارێ کە مسافرانی دەرەوەی تێدا چاوەڕێی سواربوونی کەرەسەی ڕاگوێزانی‌تر دەبن.

**سالنامه** / sālnāme، ـها/: اسم. سالنامە: ۱. ساڵنما؛ کتێبێ کە ڕووداوی ساڵێکی تێدا دەنووسرێ ۲. گۆڤارێ کە ساڵێ جارێک بڵاو دەکرێتەوە.

**سالنما** / sālnemā/ ☜ **تقویم ـ۱**

**سالوس**[1] / sālûs/: اسم. [ادبی] ۱. فێڵبازی؛ گزیکاری؛ گزەونی؛ گزەدەری؛ سالۆزی؛ سالۆسی؛ هەنگ؛ فرت و فێڵ؛ فاک و فیک؛ خاپینۆکی؛ خاپێنی ۲. ماستاوکەری؛ زمانبازی؛ خوڵتەکەری؛ زمانلووسی ✽ **سالوسی**

**سالوس**[2] / ـان/: صفت. [ادبی] ۱. فێڵباز؛ گزیکار؛ گزەون؛ گزەدەر؛ سالۆز؛ سالۆس؛ خاپینۆک؛ خاپێن ۲. ماستاوکەر؛ زمانباز؛ خوڵتەکەر؛ زمانلووس.

**سالوسی** / sālûsî/ ☜ **سالوس**[1]

**ـ ساله** / sāle/: پیوَژه. ـ ساڵان؛ ـ ساڵە؛ ـ ساڵ؛ ـ ساڵێ (بۆ مێ): ۱. پێوەندیدار بە ئەژماری ساڵگەل؛ پێوەندیدار بە مەودایەکی زەمانی بە پێی ساڵ ‹دەساله: دەساڵان› ۲. خاوەن تەمەن یان عومر بە پێی ساڵ ‹مرد چهل‌ساله؛ شهر هزارساله: پیاوی چل‌ساڵان؛ شاری هەزارساڵە›.

**سالی** / sālî/: قید. ساڵێک؛ ساڵێ؛ ساڵێوە؛ ساڵیە؛ یێ‌ساڵ: ۱. بە پێی ساڵ ‹هزینەی نگهداری آنجا سالی چند هزار تومان بیشتر نبود: خەرجی نواداری ئەوێ ساڵێک چەند هەزار تمەن زۆرتر نەبوو› ۲. لە درێژایی هەر ساڵدا ‹کارگران سالی یک ماه مرخصی دارند: کرێکاران ساڵێ مانگێ پشوویان هەیە›.

▣ **سالی دوازده ماه:** ساڵ دوازدە مانگ؛ دوانزەمانگەی خوا؛ سەرانسەر ساڵ؛ تەواوی ساڵ: **سال به دوازده ماه**

**سالیان** / sāliyān/: جمعِ ☜ **سال**

▣ **سالیان سال:** چەنای چەن‌ساڵ؛ ساڵانی ساڵ؛ ساڵیانی ساڵ؛ ساڵەهای ساڵ؛ ساڵانی ڕەبەق؛ ساڵەهای ساڵ ‹سالیان‌سال بود کە از او خبری نداشت: چەنای چەن‌ساڵ بوو کە لێی بێ‌خەبەر بوو›.

**سالیانه** / sāliyāne/ ☜ **سالانه**

**سالیسیلات** / sālîsîlāt/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] سالیسیلات؛ خوێی ئەسید سالیسیلات.

**سام** / sām/ ☜ باد سام، **باد**

**ساماریم** / sāmār(i)yom/: [فرانسوی]/اسم. ساماریوم؛ توخمێکی کیمیایی کانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان بە ژمارەی ئەتۆمی ۶۲ و کێشی ئەتۆمی ۱۵۰٫٤، خۆڵەمێشی و بە خوێگەلی سەوز و چێرەییەوە کە لە

دروست‌کردنی شووشه‌ی چاویلکه‌دا که‌ڵکی لێ ده‌گرن.

**سامان** / sāmān/: /اسم. ١. سامان؛ ڕێک‌وپێکی؛ ته‌کووزی ٢. سه‌رزه‌وین؛ مه‌ڵبه‌ند؛ شوێن؛ ناوان؛ به‌ر و بووم ٣. بژیوی؛ که‌ل‌وپه‌لی ژیان ٤. [قدیمی] شۆ؛ ئه‌ندازه؛ گۆره‌با ٥. [قدیمی] توان؛ هێز؛ هاز؛ هازی. هه‌روه‌ها: **سامان دادن؛ سامان گرفتن؛ سامان یافتن**

**ساماندهی** / sāmāndehî/: /اسم. سامانده‌ری؛ کار یان ڕه‌وتی ڕێک‌وپێک‌کردن؛ ته‌کووزکردن؛ هه‌ڵپه‌ڕتاوتن؛ سامان دان؛ پۆڕکردن؛ پۆڕاندن ‹ساماندهی اقتصاد: سامانده‌ری ئابووری›.

**سامانمند** / sāmānmand/: صفت. دروست؛ سامانمه‌ند: ١. به‌ ڕێک‌وپێکی ‹برای اداره‌ی کارخانه از روشهای سامانمند بهره می‌گرفت: بۆ به‌ڕێوه‌بردنی کارخانه له‌ شێوه‌گه‌لی دروست که‌ڵکی وه‌رده‌گرت› ٢. ڕێک‌وپێک؛ به‌ سامان؛ ته‌کووز؛ به‌ شێوه‌یه‌کی دروست و شیاو ‹کارخانه دارای وضع سامانمندی است: کارخانه باروودۆخێکی ڕێک‌وپێکی هه‌یه›.

**سامانه** / sāmāne ، ـها/: /اسم. دوزه‌نه؛ سیسته‌م.

**سامبا** / sāmbā/: [فرانسوی از پرتغالی]/اسم. [قدیمی] سامبا؛ سه‌مایه‌کی کۆنی برزیلی که‌ تووند و پرجم‌وجووله‌ و له‌ سه‌ماکانی باوی ئه‌فریقا ده‌چێ.

**سامعه** / sāme'e/: [عربی]/اسم. [ادبی] ژنه‌وایی؛ شنه‌وایی ‹حس سامعه: هه‌ستی ژنه‌وایی›.

**سامی** / sāmî ، ـها؛ ـان/: /اسم. سامی: ١. به‌شێکی گه‌وره‌ له‌ مه‌ردمی سپی پێست، بریتی له‌ عه‌ره‌ب، جووله‌که‌، ئاشۆریان، ئاکه‌دیگه‌لی کۆن، که‌نعانیان و به‌شێ له‌ خه‌ڵکی حه‌به‌شه‌ ٢. لقێک له‌و زمانانه‌ که‌ پێکه‌وه‌ نزیکن، وه‌کوو عه‌ره‌بی، عیبری، ئاشۆری و حه‌به‌شی.

**سامورائی** / sāmûrā'î/: [فرانسوی/ انگلیسی از ژاپنی]/اسم. ساموورایی: ١. چینێک له‌ ئاغه‌واتی شه‌ڕکه‌ر له‌ ژاپۆنی سه‌رده‌می ده‌ره‌به‌گایه‌تیدا ٢. /ـها؛ ـان/ هه‌ر یه‌که‌ له‌ که‌سانی ئه‌و چینه‌.

**سان**[1] / sān/: /اسم. سان: ١. ڕێ و ڕه‌سمێ که‌ تێیدا که‌سانی کۆمه‌ڵه‌یه‌ک (زۆرتر) چه‌کداری، به‌ ڕیز و ته‌کووز ڕاده‌وه‌ستن هه‌تا سه‌رکرده‌ یان بالاده‌ستێک له‌ به‌رده‌میاندا تێپه‌ڕێ ٢. هۆزی ڕه‌ش‌پێستی باشووری ئه‌فریقا (زۆرتر دانیشتووی بووتسوانا) ٣. هه‌سان؛ به‌رده‌سان؛ کارتیک؛ به‌راق؛ به‌رده‌لووسی کارد، شیر و ئه‌وانه‌ تیژ کردن ٤. [قدیمی] پشک؛ باهر؛ به‌ش؛ به‌شه‌؛ گیهه‌ڤ؛ گوێچ.

▣ **سان دیدن:** سان دیتن؛ به‌شداری‌کردن ده‌ ڕێ‌وڕه‌سمی ساندا، بیستنی گوزارشتی سه‌رکرده‌ و تێپه‌ڕین له‌ به‌رانبه‌ر که‌سانێکه‌وه‌ که‌ له‌ سه‌ر هه‌ست ڕاوه‌ستاون.

**ـ سان**[2]: پسوند. ـ ئاسا؛ ـ سان؛ ـ گۆڕ؛ چه‌شن ‹کشسان؛ یکسان: کێش‌ئاسا؛ یه‌کسان›.

**ساناتوریم** / sānātoryom ، ـها/: [؟]/اسم. حه‌سانگه‌؛ هه‌سانگه‌؛ جێ حه‌وانه‌وه‌.

**سانترالیسم** / sāntrālîsm/: [فرانسوی]/اسم. [سیاست] ناوه‌ندوازی؛ ناوه‌ندخوازی؛ بڕوا به‌ پێویست بوونی ناوه‌ندی بڕیاردان و به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی و فه‌رمانبه‌رداری له‌و ناوه‌نده‌.

▣ **سانترالیسم دمکراتیک:** ناوه‌ندخوازی/ ناوه‌ندوازی دیموکراتیک؛ باوڕ به‌ ناوه‌ندێک که‌ ئه‌ندامانی به‌ ڕاپرسی ئازادانه‌ هه‌ڵبژێردرێن و به‌ شێوه‌ی دیموکراتێک بجووڵێنه‌وه‌.

**سانتریفوژ** / sānt(e)rîfûj/: [فرانسوی]/اسم. سانتریفووژ؛ سانتریفیووژ؛ که‌رسته‌ی جیا کردنه‌وه‌ی ته‌نگه‌لی جۆراوجۆر به‌ قورسی جیاوازه‌وه‌، گرتنی ئاو، ته‌ڕایی یان هه‌ڵمی ماکێک به‌ شێوه‌ی سووڕدانی زۆر به‌ قه‌وه‌ت ٢. جیاکردنه‌وه‌ یان ئاوگرتن به‌و که‌رسته‌یه‌.

**سانتیگراد** / sāntîg(e)rād/: [فرانسوی] ☜ درجه‌ی صدبخشی، **درجه**

**سانتیگرم** / sāntîg(e)ram/: [فرانسوی]/اسم.

سانتیگرەم؛ یەکەی کێشان بەرامبەر بە ٠,٠١ گرەم.

**سانتی‌لیتر** / sāntîlîtr/: [فرانسوی]/اسم. سانتی‌لیتر؛ یەکەی بارستی تراو بەرامبەر بە ٠,٠١ لیتر.

**سانتیم** / sāntîm/: [فرانسوی]/اسم. سانتیم؛ سەدیەکێکی فرانک (پارەی پێشووی فەرانسە و هەندێ لە ولاتانی‌تر) و یورۆ (پارەی ئێستاکەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئورووپا).

**سانتیمانتال** / sāntîmāntāl/: [فرانسوی] *صفت.* ١. هەستۆک؛ پڕهەست؛ تیژهەست؛ خوێنگەرم ٢. *[گفتاری]* تەڕپۆش؛ لەڤەند؛ ڕازاوە؛ خوشیک؛ وەش‌دوخت ‹یک دختر سانتیمانتال در را به رویم باز کرد: کچێکی تەڕپوش دەرگای بەڕوومدا کردەوە›.

**سانتیمتر** / sāntîmetr/: [فرانسوی]/اسم. سانتیمتر؛ یەکەی پێوانی درێژایی بەرامبەر بە ٠,٠١ میتر.

▣ **سانتیمتر مربع**: سانتیمتری چوارگۆشە/ چوارگۆش؛ یەکەی رووبەر بەرامبەر بە ٠,٠٠٠١میتری چوارگۆشە.

**سانتیمتر مکعب**: سانتیمتری چوارپالوو/ چوارپال؛ یەکەی بارست بەرامبەر بە ٠,٠٠٠٠٠١ میتری چوارپالوو.

**سانحه** / sānehe ، ـها؛ سوانح/: [عربی]/اسم. کارەسات؛ کەت؛ ڕووداوی لەپڕ و ناخۆش ‹در یک سانحەی هوایی چند نفر کشته شدند: لە کارەساتێکی هەواییدا چەند کەس کوژران›.

**ساندویچ** / sāndevîč ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. نەوالە؛ بابۆلە؛ بالۆلە؛ لەفە؛ لەففە؛ قەپالە؛ قەبالە؛ قەوالە؛ باسترمە؛ کادک؛ دورووم؛ دورمە؛ لوت؛ هۆچ؛ ساندویچ؛ تیکە پێخۆری بە نان پێچراو ‹دو تا ساندویچ مرغ بخر: دوو نەوالەی مریشک بکڕە›.

**ساندویچی**[1] / sāndevîčî ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ١. نەوالەیی؛ نەوالەفرۆش؛ بابۆلەفرۆش؛ ساندویچی ‹برو به ساندویچی بگو، پنج‌تا ساندویچ مرغ بگیرد: بڕۆ بە نەوالەفروش بلێ پێنج‌دانە نەوالەی مریشکمان بۆ سازبکا› ٢. دووکانێ کە ساندویچی تێدا دەفرۆشن.

**ساندویچی**[2]: *صفت.* بابۆلە؛ نەوالەیی ‹نان ساندویچی: نانی بابۆلە›.

**سانسکریت** / sānsk(e)rît/:/اسم. سانسکریت؛ سەنسکریت؛ لە زمانە هیندو-ئێرانیەکان؛ زمانی کەونارای گەلی ئاریایی هیند.

**سانسور** / sānsor ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. سانسۆر؛ پشکاندنی ڕۆژنامە، گۆڤار، فیلم، شانۆنامە و هەمووجۆرە بلاڤۆکێک بەر لە بلاوبوونەوەی، بۆبەرگری لە پەرەساندنی هەواڵ، قسە یان وێنەگەلی دیاریکراو.

**سانسورچی** / sānsorčî ، ـها/: [فرانسوی/ ترکی] /اسم. سانسۆرچی؛ کەسێ کە ئیشی سانسۆر کردنە.

**ساواکی** / sāvākî ، ـها/:/اسم. ساواکی؛ بەرێوەبەر یان کارگێری ڕێخراوەی ئاسایشی ئێران (لە سالانی ١٣٣٦ تا ١٣٥٧).

**ساوجی** / sāvacî, sāvocî ، ـها؛ ـان/: *صفت.* ساوەجی؛ ساوەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە شاری ساوە ‹سلمان ساوجی: سەلمانی ساوەجی›.

**ساولن** / sāvlon/: [انگلیسی]/اسم. ساولۆن؛ چەشنێک تەوشی دژەگەن بۆ سڕینەوەی کیم و زووخی برین.

**ـ سای** / sā/ ☜ **ـ سا ـ٢**

**سایا** / sāyā/: *صفت.* بساو؛ بە تایبەتمەندی یان لێهاتوویی سواندنەوە (وەکوو ئەلماس، سماتە، مۆرەت و...)

**سایاندن** / sāyāndan/: *مصدر. متعدی.* // **ساياندی**: سواندت؛ **می سایانی**: دەسوێنێ؛ **بسایان**: بسوێنە// سواندن؛ سوینەوە؛ ساودان؛ سوانن؛ بوونە هۆی سوانی شتێک.

**سایبان** / sāyebān ، ـها/:/اسم. ١. سەیوان؛ سایەبان؛ سایەوان؛ سابات؛ چەرداخ؛ سەهاڤ؛ میچێکی سووک بۆ بەرگری هەتاو یان باران بە

سەر شوێنێکی ئاوەڵادا ‹در خانەشان سایبان دارد: درگای ماڵەکەیان سەیوانی هەیە› ۲. ساباٖت؛ سەیوانە؛ کەرەسەیەکی چەترئاسا بە هەسوونێکەوە بۆ بەرگری لە باران یان تیشکی خۆر.

**سایت** / sāyt ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ۱. پایەگا؛ بنکە؛ شوێنی دامەزراندنی ڕادار یان سەکۆی مووشەک هاویشتن ‹سایت موشکی: پایەگای مووشەکی› ۲. سایت؛ ماڵپەڕ؛ ناوەندێک بە ناونیشانێکی تایبەتەوە لە ئینتەرنێتدا ‹این خبر روی سایت بی‌بی‌سی آمده: ئەم هەواڵە لە سەر سایتی بی‌بی‌سی هاتووە›.

**سایدبای‌ساید** / sāydbāysāyd/: [انگلیسی] *صفت.* هاوتەک؛ هاوپاڵ؛ پاڵ‌بەپاڵ یەک جێگرتوو.

**سایر** [1] / sāyer/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* ۱. ڕڤۆک؛ ڕەوۆک؛ ڕەوان ۲. باو؛ داکەوتوو ‹مثل سایر: مەتەڵی باو› ۳. دیکە؛ دی ‹در سایر کتابها هم نوشته‌اند: لە کتێبانی دیکەشدا نووسیویانە› ✱ **سائر**

**سایر** [2] / ـین/: ضمیر. دیکە؛ باقی؛ دیتر؛ کەس، شت یان بابەتی‌تر جگە لەوەی باسی لێوە دەکرێ یا ئاماژەی پێ کراوە ‹آرام آنجا ماند و سایرین رفتند: ئارام، لەوێ مایەوە و باقی ڕۆیشتن›: **سائر**

**سایز** / sāyz ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ئەندازە؛ ئەنازە؛ بەر؛ ژمارە؛ ئەندازەی بەرگ و پۆشەن، کڵاو، کەوش و وەک ئەمانە ‹سایزتان چند است؟؛ این سایز شماست: ئەندازەتان چەندە؟؛ ئەمە بە بەری تۆیە›.

**سایش** / sāyeš/:/اسم. ۱. کار و ڕەوتی ساوین؛ ماڵین؛ ساوینەوە؛ ساودان ‹می‌توان بە وسیلەی سایش سطح آن را صیقل داد: بە ساوین ڕووەکەی لووس ئەکرێ› ۲. کار و ڕەوتی ساویان؛ ساویانەوە؛ ماڵیان ‹بر اثر سایش پارە شدە است: بە هۆی ساویانەوە دڕاوە›.

**سایقه** / sāyeqe ، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ئەنگێزە؛ بزوێنە: **سائقه**

**سایکوز** / sāykoz/: [؟]/اسم. *[روانشناسی]* پەڕۆشی؛ شێواوی؛ ڕەوان‌شپرزی؛ ڕەوان‌کژی.

**سایل** / sāyel ، ـان/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ۱. خوازەڵۆک؛ سواڵکەر؛ گەدا؛ دەرۆزەکەر ۲. *[نامتداول]* پرسیارکەر ✱ **سائل**

**سایه** / sāye ، ـها/:/اسم. سێبەر؛ سێوەر؛ سەیوەر؛ سا؛ سای؛ سایە؛ ساگات: ۱. سێکک؛ سەهان؛ سەهین؛ سەهەند؛ سەهەن؛ سەهەنگ؛ سایەک؛ سەی؛ سهـ ؛ سها؛ سێهـ ؛ لێڵی یان تاریکیەک کە بە هۆی نەبوونی ڕووناکی ڕاستەوخۆوە بەدی دێ ۲. شەم؛ نسێ؛ نیسێ؛ بێتاو؛ نسار؛ نسرم؛ لاسار؛ سێکک؛ سەهان؛ سەهین؛ سەهەند؛ سەهەن؛ سەهەنگ؛ سایەک؛ سەی؛ سهـ ؛ سها؛ سێهـ ؛ شوێنێ کە ئاوەها دۆخێکی هەیە. بەرانبەر: **آفتاب** ‹اینجا آفتاب است، برویم بە سایه: ئێرە هەتاوە، بچینە سێبەروە› ۳. سێکک؛ سایەک؛ سەی؛ سهـ ؛ سها؛ سێهـ ؛ وێنەیەک لە شتێکی ناڕوون کە بە هۆی کەوتنە بەر ڕووناکیەوە، لە دژبەریدا بەدی دێ ‹سایه‌اش افتاده بود روی دیوار: سێبەرەکەی کەوتبووە سەر دیوار› ٤. *[مجازی]* ئەوەی بتوانێ پشتی کەسێ یان شتێک بگرێ ‹در سایه‌ی پولی کە بدست آوردە بود، زندگی باشکوهی داشت: لە سایەی پارەیەک کە دەستی کەوتبوو، ژیانێکی هەنگوونگی بوو› ٥. *[مجازی]* ئەوەی بە شێوەی نوقسان و لێڵ دیار دەبێ ‹سایه‌ی لبخندی در گوشه‌ی لبش نمایان شد: سێبەری بزەیێ لە گۆشەی لێویەوە دەرکەوت› ٦. بەشێک لە وێنەکێشی یان نەقشە کە بە ڕەنگ بۆ نیشان‌دانی قووڵی یا پاڵوو کەڵک وەردەگرن ۷. سێ؛ ماکێکی ڕازێنەوەیی ئارایشتی و ڕەنگین و هەندێک چەور کە ژنان بە پشتی چاویانەوە دەساون ۸. *[مجازی]* تاپۆ؛ تارمایی؛ سوێس؛ شوێنەوار یان نیشانەی شتێک ‹سایه‌ی مرگ: سێبەری مەرگ›.

⊡ سایه افکندن ☜ **سایه انداختن**

**سـابه انـداختن:** سـێبەر خـستن: ١. سـێبەر کـردن؛ سـەی کـەردەی؛ بـەر تیـشکدانەوەی ڕاستەوخۆی ڕووناکی گرتن ‹**درختان بر بخشی از حیاط** سایه انداخته بودند: **دارەکان بە سەر بەشـێکی حەوشـەدا** سـێبەریان خـستبوو› ٢. *[مجـازی]* شوێن‌دانان؛ شوێن خـستن؛ شـوێنەوار دانـان ‹**سکوت همەجا** سایه انداخته بود: **بێدەنگی** سێبەری خستبووە **سەر هەموو لایەکدا**› ❋ **سایه افکنـدن** *[ادبی]*

**سایه بودن:** سێبەر بـوون؛ نـسار بـوون؛ نـسرم بوون؛ سەی/ سای بییەی ‹**پشت آن دیـوار** سـایه است: **پشت ئەو دیوارە** سێبەرە›.

**سـایه بـە سـایەی کـسی رفـتن:** *[مجـازی]* جووچکەشوانەی کەسـێ بـوون؛ دوا بـە دوای کەسێ چوون؛ قەرە وە قەرەی کەسێ کەفتن؛ کەوتنە شـوێن کەسـێ بـۆ هـەموو شـوێنێک ‹سـایەبـەسـایەاش رفـتم **تـا ببیـنم کجـا مـی‌رود:** دوابەدوای چووم، **ببینم بۆ کوێ دەڕوا**›.

**سـایه زدن:** سـێبەر لێـدان: ١. پـڕڕەنگ کردنەوەی بەشێ لە وێنە بۆ زیاتر دیار بـوونی ٢. سایه لێدان؛ ساوینی سایه ‹**پشت چشمها را** سایەی **غلیظی** زده بود: سایەیێکی **توندی لە پـشت چاوی** دابوو›.

**سایەی کسی را با تیر زدن:** *[مجازی]* پێ لە سەر سێبەری کەسێ نان؛ لە شوێن سێبەر کەسـێ گەڕان؛ لەگەڵ کەسێکدا زۆر دوژمن بـوون ‹**او** سایەی مرا با تیر می‌زد: **ئەو** پێی لە سەر سێبەری من داددنی›.

**سایەی کسی روی سر دیگری بـودن:** *[مجـازی]* سێبەری کەسێ لە سەر کسێکی‌ترەوە بـوون؛ حەوانەوە بە هۆی کەسێکی‌ترەوە.

**سایەی کسی سنگین شدن:** *[مجازی]* بـڕیتی لـە لێ‌نەپرسین؛ هەواڵ نەپرسین؛ سەر لێ‌نـەدان؛ لە هـاتوچۆکـەوتن؛ ئیتـر ئـاموشـۆ نـەکردن ‹**مدتی است** سایەی سرکار سنگین شده: **ماوەیەکە** لیمان ناپرسن›.

**سایەی کسی کم نشدن:** *[کنایی]* سایەی کەسـێ کەم نەبوون؛ میهرەوانی و پشتیوانی کەسێک بەردەوام بوون ‹سایەتان کم نشود: سایەتان کـەم نەبێ›.

**سـایه گـستردن:** سـێبەر خـستن: ١. سـێبەر شوێنێ داگرتن؛ سەی وسەی ٢. *[مجازی]* زاڵ بوون؛ چڕ بوون ‹**وحشت بر همە جا** سایه گسترده بود: **ترس لە هەموو شوێنێ** سێبەری خستبوو›.

**از سایەی خود ترسـیدن:** *[کنـایی]* لـە خـشەی گەڵا ترسان؛ لە سێبەری خۆ ترسان؛ لـە بـای زگی خۆ ترسان؛ بە کشێ مردن؛ لـە خـشەی تالوو ڕەوینەوە؛ تووشـیاری ترسـی زۆر هـاتن ‹**آن روزها مردم** از سایەی خودشان **هم** مـی‌ترسیدند: لـەو سـەردەمانەدا خەڵـک لـە خـشەی گـەڵاش دەترسان›.

**زیـر سـایەی کـسی بـودن:** *[مجـازی]* لـە ژێـر سێبەری کەسێکدا بوون؛ وە بەر پـشتیوانی و پاڵپشتی کەسێک بوون.

**مثل سایه دنبـال کـسی بـودن:** *[مجـازی]* وەک سێبەر بە دوو/ دوای/ شوێن کەسێکەوە بوون؛ دوا بە دوای کەسێکەوە بوون.

**سایەافکن** / sāye’afkan/ ☜ **سایەگستر**

**سایەخشک** / sāyexošk, -xošg/: *صفت.* وشـک کراو یان وشکەڵاتووی بەر سێبەر.

**سـایەدار** / sāyedār ، ـهـا/: *صـفت.* سـێبەردار؛ سـێوەردار؛ سـادار ‹درختـان سـایەدار: دارگـەلی سێبەردار›.

**سـایەدوزی** / sāyedûzî/: *اسم. [خیـاطی]* جـۆرە دروومـانێکی زیگزاگـە لـە پـشتەوەی پارچـە دەکرێ و تەنیا سێبەرێکی دەکەوێتە ڕوو.

**سایەرس** / sāyeras/: *صفت.* سایەڕەس؛ پێگـەییو لە سێبەردا (سەبارەت بە میوەوە).

**سایەرو** / sāyerû/: *صفت.* بەرسێبەر؛ نسێ؛ نسار؛ بـەرەو سـێوەر ‹اتـاق سایەرو: ژووری بەرسـێبەر›.

بەرانبەر: **آفتابرو**

**سایەروشن** / sāyerowšan, -ro:šan/: *اسم.* تاریک و ڕوون: ١. بەشگەلی تاریک و ڕوون کە بەرزی و نزمی و بارستایی و چۆنیەتی بەر تیشک کەوتنی شتان نیشان دەدات ٢. شوێنێ کە بەشگەلێکی لێڵ و تاریک و بەشەکانی تری ڕوونە ‹در سایەروشن اتاق همەچیز حالت رؤیایی داشت: لە تاریکوڕوونی ژوورەکەدا هەموو شتێ باریکی خەیالاوی بوو› ٣. بوومەلێڵ؛ بوولێڵە؛ گورگومێش؛ گاڤێ لە ڕۆژ کە هێشتا ڕووناکی یان تاریکی بە تەواوی چیر نەبووە ‹در سایەروشن غروب درختان بە صورت اشباح هولناک بە نظر می‌آمدند: لە بوومەلێڵی ئێوارەدا دارەکان وەکوو تاپۆگەلێکی سامناک دەهاتنە بەر چاو›.

**سایەسار** / sāyesār/: *اسم. [ادبی]* نسار؛ نزار؛ سەهەن؛ سەهەند؛ سەهەنگ؛ ساگات؛ نسوم؛ زەوی یان جێگایەک کە لە بەر سێبەردا بێت (بەتایبەت لە سێبەری داردا).

**سایەگستر** / sāyegostar/: *صفت. [ادبی]* ١. سێبەردار؛ سێوەردار؛ بە سێبەری پان و پۆڕەوە ‹درختان سایەگستر: دارگەلی سێبەردار› ٢. *[مجازی]* زاڵ؛ چێر؛ چیر؛ بە شوێنەوای داسەپاویەوە ‹سکوت بر همەجا سایەگستر شد: بێدەنگی لە هەموو شوێنێک زاڵ بوو› ❋ **سایەافکن**

**سایەوار** / sāyevār/: *قید.* وەک سێبەر؛ سایەسا؛ سێوەرئاسا ‹سایەوار دنبالش می‌کرد: وەک سێبەر کەوتبووە شوێنی›.

**ـ سایی** / sāyî/: *پیواژە.* ساوین؛ مالین: **ـ سائی**

**سائیدگی** / sāyîdegî/: *اسم.* سواوی: ١. کار یان ڕەوتی سوان؛ سوویان؛ مالیان ٢. *[گفتاری]* شوێنەواری سوان ‹دو ـ سە جای شلوارش سائیدگی داشت: دوو ـ سێ شوێنی پانتۆڵەکەی سواوی هەبوو›: **سائیدگی**

**سائیدن** / sāyîdan/: *مصدر. متعدی. لازم.* // **سائیدی:** ساویت؛ **می‌سایی:** دەساوی؛ **بِسای:** بساوە// ◻ *متعدی.* ١. ساوین؛ ساودان؛ ساین؛ هەساوین؛ هەسوون؛ هەسوان؛ سوین؛ سووین؛ سوون؛ سوینەوە؛ سوونەوە؛ سواندن؛ لۆسان؛ هێسوون؛ هۆسین؛ مالین؛ مالەی؛ مالای؛ پێدا مالین؛ شتێک لە شتێکیتر پەیتا ــ پەیتا و بە گوشارەوە خشاندن ‹دستهایش را بهم می‌سایید: دەستی لێک دەساوی› ٢. هەنوون؛ ناوین؛ ناوەی؛ ناوای؛ ساودان؛ قەمشتن؛ شتێک بە هۆی ساوینی لە پەستا و بە تەوژمی پێساوێکەوە، برین، ورد کردن یان سوان ‹زعفران سایيدن: زافەران ساوین›: **سودن** *[ادبی]*؛ **سابیدن** *[گفتاری]* **سائیدن.** هەروەها: **ساییدنی** ◻ *لازم.* ٣. سوان؛ سێویان؛ سوویان؛ ساوەی؛ ساوای؛ مالیان.

■ صفت فاعلی: **ساینده** (ـ)/ صفت مفعولی: **ساییده** (ساویاگ)/ مصدر منفی: **نَساییدن** (نەساوین)

**ساییده** / sāyîde/: *صفت.* قەسپ؛ سواو؛ ساویاگ؛ سێویاگ؛ سوویاگ؛ ساویا؛ سایسە.

**سئانس** / se'āns/: [فرانسوی] ☜ **سآنس**

**سبّابه** / sabbābe/: [عربی] ☜ انگشت سبابە، **انگشت**

**سبب** / sabab ، ـها؛ اسباب/: [عربی] *اسم.* هۆ؛ هاوا؛ سۆنگە؛ بۆنە؛ بۆن: ١. سەخمەراتی؛ ئەوەی کە دیاردە یان ڕووداوێک پێکدێنێ ‹باد سبب شکستن شیشەها شد: با بوو بە هۆی شکانی شووشەکان› ٢. سەوەو؛ ئامراز و ئەسپاب ‹سارا سبب آشنایی ما شد: سارا بووە هۆی ئاشنایی ئێمە›. هەروەها: **سبب بودن؛ سبب شدن**

**سبب‌ساز** / sababsāz/: [عربی/ فارسی] *صفت. [ادبی]* هۆساز؛ سۆنگەساز؛ هۆ ڕەخسێن؛ هۆ پێکهێن؛ پێکهێنەری ئامرازی پێش‌بردنی کار ‹خدا خودش سبب‌ساز است: خوا بۆ خۆی هوسازە›.

**سبب‌سازی** / sababsāzî/: [عربی/ فارسی] *صفت. [ادبی]* هۆسازی؛ بۆنەسازی؛ سۆنگەسازی؛ هۆ پێکهێنەری: ١. دۆخ یان چۆنیەتی هۆساز بوون

٢. کار و ڕەوتی پێکهێنانی ئامراز یان هەلی پێویست.

**سبب‌شناسی** / sababšenāsî/: [عربی/ فارسی] /اسم. هۆناسی؛ بەشێک لە ئازارناسی کە لە هۆکاری نەخۆشیەکان دەکۆڵێتەوە.

**سببی** / sababî/: [عربی] صفت. هۆیی؛ سۆنگەیی پێوەندیدار بە هۆوە.

▣ **خویشاوند سببی** ☜ **خویشاوند**

**سبحان‌الله** / sobhānallāh/: [عربی] دعا. سوبحانەڵلا: ١. خوا لە کەم و کووڕی پاک و پوارە ٢. تەح؛ حەح؛ پەکوو؛ وشەیێک بۆ دەربڕینی سەر سووڕمان.

**سبد** / sabad ، ـها/:اسم. سەبەتە؛ سەوەتە؛ سەڤی؛ سەبەت؛ سەل؛ سەوە: ١. دەفریٚ لە ڕێسە یان تووڵ چنراو بۆ ڕاگرتن یا هەڵگرتنی شت ٢. سەلک؛ تریان؛ تریانە؛ قرتالە؛ قەرتالە؛ قەتوف؛ بەرچن؛ بەرچینە؛ بەرچنە؛ سەبەتی میوەچنی ٣. سەلە؛ نانەشان؛ سەوین؛ سەلە؛ سەلەشیرک؛ سەوەتەی کون-کون بۆ ئاوەچۆڕ کردن ٤. زەمبیل؛ دەسەچینە؛ دەسەچنە؛ پووشینە؛ زەنبیل.

▣ **سبد خانوار**: [اقتصاد] سەبەتی ماڵبات؛ سەرجەم ئەوەی ماڵباتێ لە جارێکدا دەیکڕێ.

**سبدبافی** / sabadbāfî/:اسم. سەوەتەچنی؛ سەبەدچنی؛ سەبەتەچنی: ١. کاری تەنین و چنینی سەوەتە؛ سەبەتە دروس کردن ٢. ـها/ کارگا یان شوێنی سەوەتە چنین؛ کارگەی درووس‌کردنی سەبەتە. هەروەها: **سبدباف**

**سبز**¹ / sabz/:اسم. سەوز؛ سەبز؛ هەوز؛ شین؛ هێشین؛ کەسک؛ زەرقی: ڕەنگێک لە نێوان زەرد و ئاویدا؛ ڕەنگی چیمەن یان گەڵای تازە ٢. هەرکام لە تیرۆژگەلی تاقەڕەنگی نێوان ٤٩٢ تا ٥٧٧ نانومیتر. هەروەها: **سبزرنگ**

▣ **سبز پاریس**: سەوزی پاریس؛ گەردی سەوزی زمرووت‌ئاسای مێرووکوژ و پارێزەری چێو، کە تێکەڵاوێکی مس و ئارسنیکە.

**سبز چمنی**: شین؛ سەوزی تۆخ؛ کەسکەتاری؛ سەوزی پڕ ڕەنگ، وەکوو سەوزەڵانی تازە.

**سبز زنگاری**: سەوزی ژەنگاری/ زەنگاری؛ ژەنگار؛ سەوزی شین و تاریک.

**سبز فیروزه‌ای**: سەوزی پیرۆزەیی؛ سەوزی تێکەڵاو لەگەڵ ئاوی پیرۆزەدا.

**سبز کاهویی**: کەسکە زەلال؛ کەسکی ئاچوخ؛ سەوزی ڕۆشن؛ ڕەنگی سەوزی بن‌زەرد(ئاماڵ زەرد).

**سبز لجنی**: کەسکە تاری؛ سەوزی تۆخ؛ کەسکی تۆخ؛ سەوزی تاریک و مات.

**سبز**²: صفت. سەوز؛ سەبز؛ هەوز؛ کەسک: ١. بە ڕەنگی سەوز ‹پارچەی سبز: پارچەی سەوز› ٢. گیاندار؛ زیندوو (بۆ گوڵ و گیا) ‹درخت سبز: درەختی سەوز›.

▣ **سبز شدن**: ١. شین بوون؛ سەوز بوون؛ سەوز بیەی؛ دەم‌دان؛ ڕوان؛ ڕسکان؛ ڕسەی؛ چەکەرەکردن و هەڵدانی گیا ‹سبز شدن نهال: شین بوونی نەمام› ٢. بوون بە سەوز؛ سەوز دەرهاتن؛ بوون بە/ بوونە سەوز؛ سەبز هەڵگەڕان ‹پس از شستن رنگش سبز شد: دوای شۆردن ڕەنگی بووبە سەوز› ٣. [مجازی] شین بوون؛ سەوز بوون؛ بۆز کردنەوە؛ سەوز بیەی؛ ڕوان؛ ڕسکان؛ ڕسەی؛ بۆر بوون؛ دەرهاتنی موو لە بان ڕوخسارەوە ‹پشت لبش تازه سبز شده بود: بەر سمێڵی تازە سەوز ببوو› ٤. [گفتاری] هاتنەدی؛ بەگا ئامەی؛ ڕێک دەرهاتنی پێشبینی ‹می‌دانستم یک روز حرفم سبز می‌شود: دەمزانی ڕۆژێ وتەکەم دیتەدی› ٥. [مجازی] پەیدا بوون؛ شین بوون؛ سەوز بوون؛ دەرکەوتن؛ لە پڕ و ناکاو هاتن؛ سەوز بیەی؛ هەڵتۆقین؛ هەڵقولین؛ هەڵقولان؛ قووت بوونەوە؛ قوت بوونەوە؛ بەرپڕەی؛ زیەی؛ پڕای

بەر ‹سر راهم سبز شد: لە سەر ڕێگام پەیدا بوو›.
**سبز کردن:** سەوز کـردن؛ تـۆم یـان گیایـەک ڕواندن.
**سبز ـ**[۲]: *پیشواژە.* سەوزـ؛ خاوەنی ڕەنگـی سـەوز ‹سبزپوش: سەوزپۆش›.
**سبزابی**[۱] / sabzābî/: *اسم.* کەسکەشـین؛ شـین؛ ڕەنگێ کە لە تێکەڵ کردنی یەک‌بەیەکی شـین و سەوز بە دەس دێ.
**سـبزابی**[۲]: *صـفت.* کەسکەشـین؛ بـە ڕەنگـی بەرهەم‌هاتوو لە تێکەڵـی ڕەنـگ‌گـەلی سـەوز و ئاوی.
**سبزپوش** / sabzpûš، ـها؛ ـان/: *صفت.* سەوزپۆش؛ کەوەلا؛ خاوەن پۆشەنی ڕەنگ سەوز.
**سبزفام** / sabzfām/: *اسم.* هەوزەک؛ کەسـکۆیی؛ سەوزواشە؛ ئاماڵ‌کەسـک؛ ئامـاڵ‌سـەوز؛ ڕەنگـی ئاماڵ سەوز.
**سبزقبا** / sabzeqabā، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* ۱. سـەوزەکۆ؛ کاسەڵەشـینکە؛ کەندەسمـــەـ؛ حـەوت‌ڕەنگیلــە؛ خەنجــەربالا؛ ئەسپەشـــینە؛ کاشەڵەشینە؛ خومـەڕژە؛ خومـەرژە؛ خومـەڕێژە؛ پەلـــەوەرێکی وەک قـــەل، تایبـــەتی ناوچـــەی گــەرمیان و فێنــک، بــە دەنــدووکی پتــەوی بـەهێزەوە، ئەنگوسـتی سـێهەم و چـوارەمی لـە بنـەوە گـووراوە و پێکـەوە لکـاوە: **سـبزەقبـا** ۲. سـەوزەمراوی؛ مراویـەکێوی؛ پـێ‌بەقنگـە؛ جۆرێ مراوی بە سـەر و ملـی سـەوز و سـنگی خەنـەیی، پـشتی قـاوەیی، دەنـدووکی زەردی مەیلەو سەوز و قاچی مەیلەو خەنەییەوە.
**سـبزە**[۱] / sabze/: *اسـم.* سـەوزە: ۱. شـینکە؛ کاخیل؛ گیای چیمەن ۲. مێوژە سەوزە؛ جـۆرێ کـشمیش ۳. سـەمەنی؛ گـەنم یـا نیـسکی بـە تایبەتی چێنـدراو و ڕوواو بـۆ سـەرەتای سـاڵ و جێژنی نەورۆز.
**سبزە**[۲] ☜ **سبزەرو**
**سـبزەرو** / sabzerû/: *صـفت.* ئەسمــەر؛ سـەوزە؛ سەوزەڵــە؛ کــەرەن‌زەر؛ ســەوزەڕەنگ؛ زەری؛ گەنمی؛ خاوەن پێستی هەنـدێک تاریـک (وەک ڕەنگی پێستی سـپی کـە ماوەیـەک لـە بـەر هـەتاو مابێتەوە): **سبزە**
**سبزەزار** / sabzezār، ـان/: *اسم. [ادبی]* ۱. مێرگ؛ شینایی؛ سـەوزەلان؛ سـەوزەلانی؛ سـەوزەلانی؛ شـینەلانی؛ شـیناهی؛ چەمـەن‌زار؛ سـەوزەزار؛ بزوێن ۲. ئاڵفجاڕ؛ لەوەرگە؛ گیاجاڕ؛ وشـکەپەل؛ چایەر؛ شوێنی پڕ لە گیا شین.
**سبزەقبا** / sabzqabā/: [فارسی/ عربی] ☜ **سبزقبا**
**سـبزی** / sabzî/: *اسـم.* ۱. /ـهـا؛ جـات/ سـەوزی؛ سـەبزی؛ سـەوزە؛ سـەوزەوات؛ ئەسـوور؛ گیـای ئالیکی کە لاسک، ڕیشوو، گەلا یـان میوەکـەی وەک بەشـێ لـە خـۆراکی سـفرە بـەکاردێ ۲. *[مجـازی]* گیـا؛ ڕووەک؛ شـینایی ۳. دۆخ یـان چۆناوچۆنی شین بوون؛ سەوز بوون.
▣ **سبزی پـاک کـردن:** سـەوزی پـاک کـردن؛ سـەبزی خـاوێن کردنـەوە؛ لابـردنی خـراوە، شۆردن و ئامادە کردنی سەوزی بۆ خواردن.
**سبزی کسی را پاک کردن:** *[کنایی]* بـۆ کەسـێ ماستاو کـردن؛ پیـازی کەسـێ پـاک کـردن؛ دالانـێ پـەی یـۆی مـالایرە؛ خۆشـخزمەتی کەسێ کردن؛ بە دەور و بەری کەسێکدا هاتن ‹این روزها خیلی سبزی رییس را پاک می‌کند: لـەم ڕۆژانە یەکجار بۆ سەرۆک ماستاو دەکا›.
**سبزی‌آرایـی** / sabzî'ārāyî sabzîārāyî/: *اسم.* ۱. کاری سفرە ڕازاندنەوە بە سـەوزی ۲. کـاری ڕازاندنەوەی سەوزی بۆ سەر سفرە.
**سبزی‌پلو** / sabzîpolow, -polo/: *اسم.* سـەوزی پلاو؛ جۆرێ پلاو کە سەوزی خواردنی تێکەڵاوە.
**سبزیجات** / sabzîcāt/: (!) [فارسی/ عربی] جمعِ ☜ **سبزی**
**سبزی‌خـوردن** / sabzîxordan/: *اسم.* سـەوزی خواردن؛ سەبزی خواردن؛ سەوزی واردەی؛ هەر کام لە سەوزەگەلێ کە پەل و پۆ، گـەلا، لاسـک

یـان ڕیـشووەکەیان بـە شـێوەی کـاڵ یـان لـە چێشتدا دەخورێ (وەک کەوەر، تەرەتیزە، ڕێحان، توور و...).

**سـبزی‌فروشی** / sabzîfurûšî/: *اسم.* سـەوزی‌فرۆشـی؛ سـەوزی‌ورەشـی: ١. کـاری سـەوزی فـرۆتن ٢. دووکـانی فرۆشـتنی سەوزیگەلی خۆراکی و میوە. هەروەها: **سبزی فروش**

**سـبزیکاری** / sabzîkārî/: *اسم.* سەوزیکاڵـی؛ تەرەکاڵـی؛ سـەوزەکاری: ١. کـاری چانـدنی سـەوزی خـۆراکی ٢. زەویـنی تایبـەتی کشت‌وکاڵی شیناوەرد.

**سـبزینه** / sabzîîne/: *اسم.* کلۆرۆفیـل؛ مـاکی سـەوزی نێـو پێکهاتـەی ڕوەک و بناخـەی بەرهەمهێنانی هیدراتگەلی کـەربون بـە هـۆی فۆتۆسەنتیزەوە.

**سبع** [1] / sabo'/: [عربی] ☜ **گُرگ ـ١**

**سبع** [2] / ـان/: [عربی] *صفت. [ادبی]* دڕنـدە؛ لاور؛ وەحشی؛ ڕاور.

**سبعانه** [2] / sabo'āne/: [عربی/ فارسی] *صفت. [ادبی]* دڕندانـە؛ لاورانـە؛ ڕاورانـە؛ وەحـشیانە ‹حملـەی سبعانه: هێرشی درندانه›.

**سبعانه** [2]: *قید.* دڕندانە؛ لاورانە؛ ڕاورانە؛ وەحـشیانە؛ بە دڕندەییەوە ‹سگ سبعانه حمله می‌کرد: گەماڵەکە دراندانە هێرشی دەبرد›.

**سـبعیت** / sabo'îyyat/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* دڕنــدەیی؛ دڕندایــەتی؛ لاورێــتی؛ ڕاوری؛ دڕندەخوویی ‹ایـن همـه سبعیت در آدم بـاورکردنی نیـست: ئەم هەموو دڕندەییە لـە مرۆڤـدا جـێ بـاوەڕ نیە›.

**سبقت** / sebqat/: [عربی] *اسم.* پێش‌بڕکێ.

▣ **سبقت گرفتن/ جستن:** پێش‌بـڕکێ کـردن؛ لـە دیتران پێش‌کەوتن.

**سبقتگاه** / sebqatgāh ، ـها/: [عربی/ فارسـی] *اسـم.* بەشێ پان لە ڕێگـەی تەسـک بـۆ پـێش بـڕکێ کردن یا لـە لای یـەک تێپـەڕینی کەرەسـەی هات‌وچۆ.

**سـبک** / sabk، ـهـا/: [عربـی] *اسـم.* شـێواز: ١. شێوەیەکی تایبەت لە بـەڕێوەبردنی کارێـک یــان پێکهێنــانی شــتێکدا ٢. ڕێ‌وزێ؛ ڕێ و ڕەوشت؛ ڕەوش ‹سبک زندگی شهری و روستایی جداست: ڕێ‌وزیـی ژیـانی لادێیـی و شـار جیـاوازە› ٣. تایبەتمەندیگەلی پێکهاتەیی نێو ئاسـەوارێک کـە پێوەنـدی بـە کـەس (نووسـەر، هۆزانـڤان، هونەرمەنـد،...) قوتابخانـە (خوراسـانی، گوتیـک، کوبیسم،...) یان دەورەیەکی دیاریکراو (ساسانی، ڕنسانس،...) نیشان دەدا.

**سبک** / sabok/: *صفت.* سـووک؛ سـۆک؛ سـفک؛ سڤک: ١. سووکەڵە؛ کەمۆکە؛ بـە کێـشی کـەم ‹بار سبک: باری سووک› ٢. بە کێشی کـەمتر لـە هەندی پێویست یان ڕەچاوکراو ‹چهار کیلو شکر خریدم، به نظرم سبک آمد، وزن کردم سه کیلو نیم بـود!: چوار کیلۆ شەکرم ساند، پێم سووک بوو، کێشام سێ کیلۆ و نیم بوو!› ٣. مەراش و ناخۆش ‹رفتار سبک: ئاکاری سووک› ٤. *[مجازی]* چـالاک؛ فـرز؛ کـرژ؛ تون ‹سبکدست: سووکدەست› ٥. *[مجازی]* هێـور؛ هێمن؛ ئاسوودە؛ ئارام؛ ڕاحەت ‹کمی گریـه کـردم، دلم سبک شد: تۆزێ گریام، سۆک بووم› ٦. هاسان؛ سانا؛ ساکار ‹کارش سبک بود، می‌توانست به درسش هـم برسـد: کارەکـەی سـووک بـوو، دەیتـوانی دەرسەکەشی بخوێنێ›.

▣ **سـبک بـودن:** سـووک بـوون؛ سـۆک بـوون؛ سووک بیەی: ١. قورس نەبوون ‹کیـف سـبک اسـت: کیفەکە سووکە› ٢. بە تەوژم یان هێـزی زۆر نەبوون ‹خواب من سبک اسـت: خـەوی مـن سووکە› ٣. *[مجازی]* هورم بوون؛ بـەپیت بـوون؛ بەرەکەت‌دار بوون ‹دستش سبک اسـت: دەسـتی سـووکە› ٤. *[مجـازی]* بـێ‌بـڕ و بایـەخ بـوون ‹رفتـارش خیلـی سـبک اسـت: کـردەوەی زۆر سووکە›.

**سبک بودن پای کسی** ☜ پای کسی سبک بودن، **پا**[1]

**سبک بودن خواب کسی** ☜ خواب سبک، **خواب**

**سبک بودن دست کسی** ☜ دست سبک داشتن، **دست**

**سبک بودن لباس** ☜ لباس سبک، **لباس**

**سبک شدن**: سووک بوونەوە؛ سۆک بوون: ١. کەم بوونەوەی قورسی شتێک ‹این دوتا را برداری سبک می‌شود: ئەم دوانە لابەی سووک دەبێتەوە› ٢. *[مجازی]* ئارام بوونەوە؛ دابەزینی گوشار یا توندی شتێ ‹از دیروز دردش سبک شده است: لە دوێکەوە ئێشەکەی سووک بووە› ٣. *[مجازی]* زەبوون بوون ‹نمی‌خواهم پیش مردم سبک شوم: نامەوێ لە لای خەڵکەوە سووک ببم›. هەروەها: **سبک کردن**

**سبکُ و سنگین کردن**: *[مجازی]* سەنگ‌وسۆک کردن؛ سۆک و سەنگین کردن؛ هەڵسەنگاندن؛ لێکدانەوە؛ وردبوونەوە؛ باش لێکدانەوە.

**سبکبار** / sabokbār، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* بارسووک؛ بارسۆک؛ سووکبار: ١. *[کنایی]* ئاسوودە؛ کەم ئەرک؛ بێ گیرۆدەیی، نیگەرانی یان دژواری ٢. سۆک و سەڵت؛ سۆک و سۆڵ؛ بەبێ کەل‌وپەل و باری زۆر. هەروەها: **سبکباری**

**سبکبال** / sabokbāl ، ـها؛ ـان/: *صفت.* تیژفڕ؛ بە فڕینی سووک و هاسانەوە. هەروەها: **سبکبالی**

**سبکپا** / sabokpā/: *صفت.* بەلەپا؛ تیژڕەو؛ بەقول؛ زیخ؛ چالاک؛ خۆشبەز.

**سبکدست** / sabokdast/: *صفت.* ١. دەست‌هەل؛ بە دەستوبرد؛ بە توانا لە کاری خۆدا ٢. *[مجازی]* دەس‌سووک؛ سووکدەست؛ خاوەنی دەستی بەپیت و بەرەکەت و قازانج بۆ دیتران.

**سبکروح** / sabokrûh/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[مجازی]* ڕەزاشیرین؛ ئێسک‌سووک؛ زوێر؛ خوێن‌شیرین؛ خوێن‌گەرم؛ ڕۆح‌سووک.

**سبکسر** / saboksar/: *صفت. [مجازی]* سووکەسەر: ١. هەرزە؛ گوێ‌نەدەر؛ لاسار لە ئاستی داب و بنەمای ئاکاری و بایەخگەلی کۆمەڵگادا ٢. کەمتەرخەم؛ بێ‌مبالات.

**سبکسری** / saboksarî ، ـها/: *اسم.* سووکەسەری؛ هەرزەیی؛ لاساری؛ گوێ‌نەدەری؛ دۆخ یان چۆنیەتی سووکەسەر بوون.

**سبک‌شناسی** / sabkšenāsî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* شێوازناسی؛ لایەنێک لە وێژەوانی کە لە سەر شێوازی شاعیر یان نووسەر یان ئاسەواری وێژەیی دەورەیەکی مێژوویی دەکۆڵێتەوە (وەک شێوەی بەکار هێنانی وشە، زاراوە، وشەی لێکدراو، باری نووسراوە و چۆناوچۆنی پێکهاتەی ڕستە).

**سبک‌عقل** / sabok'aql/: [فارسی/ عربی] ☜ **سبک‌مغز**

**سبک مغز** / sabokmaqz/: *صفت. [مجازی]* لاژ؛ لاژگ؛ کەم‌ئاوەز؛ نەفام؛ هش‌سڤک؛ بەرزەعەقڵ؛ کەم‌فام؛ ئاقڵ‌سووک؛ گێلۆکە؛ گەمژە؛ گۆل؛ بە لێهاتوویی زەینی و بەهرەی هۆشی کەمەوە: **سبک‌عقل**

**سبک‌وزن** / sabokvazn/: [فارسی/ عربی] *صفت.* سووک؛ سۆک؛ سڤک: ١. بە کێشی کەم ‹دزد به سراغ چیزهای سبک‌وزن می‌رود: دز سۆسەی شتانی سووک دەکا› ٢. *[ورزش] الف)* بە کێشی ٦٠ تا ٦٧,٥ کیلۆگرەم لە وەزنەهەڵگریدا *ب)* بە کێشی ٦٢ تا ٦٧ کیلۆگرەم لە زۆرەبانێدا *ج)* بە کێشی ٥٧ تا ٦٠ کیلۆگرەم لە بوکسدا.

**سبکی** / sabokî/: *اسم.* سووکی؛ سۆکی: ١. سڤکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سووک بوون ‹بار به این سبکی را نمی‌توانی بلند کنی؟: بار بەم سووکە ناتوانی هەڵگری؟› ٢. *[مجازی]* کارگەلی بێ‌بایەخ و ناخۆش ‹این‌قدر سبکی نکن!: ئەوەندە سووکی مەکە!›. هەروەها: **سبکی‌کردن**

**سبکی** / sabkî/: [عربی] صفت. شێوازی؛ پێوەندیدار یان سەر بە شێوازەوە ‹ویژگیهای سبکی شعر هندی: تایبەتمەندیگەلی شێوازی شیعری هیندی›.

**سبل** / sabal/: [عربی] اسم. سەبەل؛ سەبەل؛ نەخۆشیەکی چاوە، چاوی پێ سوور دەبێ و هەڵدەماسێ.

**سبو** / sabû ، ـها/: اسم. [ادبی] گۆزە؛ گۆزک؛ گۆزێ؛ سەویل؛ کووزی؛ کووزوو؛ کووپە؛ کووپەڵە؛ سەویلک؛ سەویک؛ جەرە؛ جەرەک؛ کەدون؛ مەرو.

**سبوس** / subûs, sobûs, sabûs/ ☜ **سُپوس**

**سب ولعن** / sab(b)-o-la'n/: [عربی] اسم. [ادبی] تووک‌ونفرین؛ تفونەحلەت؛ تووک و نزا؛ جنێو و سخێف ‹همه او را سب و لعن می‌کردند: هەموو تووک و نفرینیان دەکرد›.

**سبیل** [1] / sabîl/: [عربی] اسم. [ادبی] رێ؛ را؛ رێگا؛ رێباز.

◙ بر سبیل: بۆ؛ ژبۆ؛ رای؛ ئەرای؛ لە رێی؛ راو؛ جە راو؛ بە شێوەی ‹بر سبیل امتحان: بو تاقی‌کردنەوە›.

**سبیل** [2]: صفت. [گفتاری] خێرات؛ بەلاش؛ خۆرایی؛ هەوانتە ‹دیشب همه جا شیرینی و شربت سبیل بود: دوێشەو لە هەموو شوێنێک شیرینی و شەربەت خێرات بوو›.

**سبیل** / sebîl, sibîl ، ـها/: اسم. سمێڵ؛ سمبێڵ؛ سمبڵ؛ سوێڵ؛ سوێل؛ سیول؛ سێول؛ زمبێل؛ زمێل؛ زمیلی؛ زمێ؛ مووی لێوی ژوورووی پیاو و هەندێک گیانەوەری‌تر.

◙ **سبیل از بناگوش در رفته**: سمێڵ بابڕ؛ سمێڵی درێژ کە تا بناگوێ دەگا.

**سبیل چخماقی**: سمێڵ چەخماخی؛ سمێڵی درێژ کە دوو سەرەکەی بەرەو ژوور با دراوە.

◙ **سبیل کسی آویزان شدن**: [کنایی] لووت کەسێک داژەنیان؛ لووت کەسێ لار بوون؛ گوپ داشۆڕیان؛ نارەحەت بوون ‹چرا سبیلت آویزان است؟: بۆچە لووتت داژەنیاگە؟›.

**سبیل کسی را چرب کردن**: [کنایی] بەر سمێڵی کەسێک چەورکردن؛ سمێڵی کەسێک چەورکردن؛ سمێڵ‌چەوری بە کەسێک دان؛ بەرتیلێکی کەم بە کەسێک دان ‹مجبور بودم سبیل نگهبان را چرب کنم: ناچار بووم سمێڵی نیگاوانەکە چەور کەم›.

**سبیل کسی را دود دادن**: [کنایی] گوێی کەسێ جەڕدان؛ گوێ کەسێ بادان؛ جەڕ سوێڵ دانی کەسێ؛ کەسێ تاشاندن؛ تەمێ‌کردنی کەسێک ‹سبیل آرام را حسابی دود دادند: گوێی ئارامیان باش جەڕدا›.

**سبیل گذاشتن**: سمێڵ هێشتنەوە؛ سوێڵ دانان؛ سمێڵەوە ئاسەی ‹یک هفته سبیل می‌گذاشت، یک هفته می‌تراشید: حەفتەیەک سمێلی دەهێشتەوە، حەفتەیەک دەیتاشی›.

**سبیلو** / sebîlû, sibîlû ، ـها/: صفت. [گفتاری] سمێڵی؛ سوێڵی ‹مرد سبیلو: پیاوی سمێلی›.

**ـ سپار** / sepār/: پیوازه. ـ سپێر؛ ـ سپار؛ بسپێر؛ ئەوەی شتێ دەسپێرێ ‹راهسپار: رێسپێر›.

**ـ سپاری** / sepārî/: پیوازه. ـ سپێری؛ کاری سپاردن؛ ئەسپاردن ‹خاکسپاری: خاکسپێری›.

**سپاس** / sepās، ـها/: اسم. [ادبی] سپاس؛ سوپاس؛ مالاقا؛ مالاوایی؛ کار یان رەوتی پێزانین و رێز گرتن ‹سپاس خدا را که کار بخوبی پایان یافت: سپاس بۆ خوا کە کارەکە بە باشی دوایی هات›.

◙ **سپاس داشتن**: [ادبی] رازی بوون؛ دڵخۆش بوون ‹از بخت خود سپاس داشتن: لە بەختی خۆ رازی بوون›.

**سپاس گزاردن**: [ادبی] سپاس‌کردن؛ سوپاس‌کردن؛ شوکرانەبژێری‌کردن؛ سپاس بەجێ‌هێنان.

**سپاسگزاری** / sepāsgozārî/: اسم. [ادبی] شوکرانەبژێری؛ سپاس و پێزانی؛ شوکورخوازی؛

ئاکارێ کە بۆ پێزانین و لەبەرچاو بوونی چاکە ئەنجام دەدرێ. هەروەها: **سپاسگزاز**

**سپاه** / sepāh/: *اسم.* سپا؛ سوپا: ١. *[ادبی]* هێزی چەکداری ٢. یەکەی چەکداری برێتی لە سێ لەشکەر.

**سپاهی** / sepāhî ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سپایی؛ چەکداری.

**سپتامبر** / septām(b)r/: [فرانسوی] *اسم.* سیپتامبر؛ ئەیلوول؛ مانگی نۆیەمی ساڵی زایینی کە ٣٠ ڕۆژە و لە ١٠ی خەرمانانەوە دەست پێدەکا.

**سپتیسمی** / septîsemî/: [فرانسوی] *اسم. [پزشکی]* خوێنپیسی: **گندخونی**

**سپتیسیسم** / septîsîsm/: [؟] *اسم. [فلسفه]* شکبەری؛ دوودڵی: **شکاکیّت**

**سپر** / separ ، ـها/: *اسم.* سپەر؛ سوپەر؛ سپێر؛ سوپێر: ١. مەرتاڵ؛ مەتاڵ؛ قەڵغان؛ قەڵخان؛ ئەسپەرە؛ پەڕەیەکی پتەوی کانزایی دەسکدار کە شەڕکەران بۆ خۆ پاراستن لە شیر و تیر پێیان بوو ٢. نەوارێکی پتر کانزایی کە بۆ پاراستنی ماشێن لە بەر و دوایەوە دانراوە ٣. *[مجازی]* هەر شتێ کە بۆ بەرگری لە گەزند و ترس بە کار دەڕوا.

▣ **سپر انداختن:** *[کنایی]* کۆڵ دان؛ چۆک دادان؛ مل دان؛ بەیدەست بوون؛ خۆ بە دەستەوە دان.

**سپر بلای کسی شدن:** *[مجازی]* خۆ دانە بەر کەسێکەوە؛ مەترسی یان دژواری کەسێک پەزێران.

**سینه سپر کردن** ☜ **سینه**

**سپردار** / separdār/: *اسم.* مێروویەکی وردیلەی تیرەی سپێیان کە مێملی داری میوەیە.

**سپردن** / sepordan/: *مصدر. متعدی. //* **سپردی:** سپاردت؛ **می سپاری:** دەسپێری؛ **بسپار:** بسپێرە// سپاردن؛ سپارتن؛ ئەسپاردن؛ سپارەی؛ سپارای؛ ئسپارەی: ١. شتێک بە ئەمانەت بە کەسێک دان بۆ هەڵگرتن و چاوەدێری لێ کردن ‹خانه را به همسایه‌مان سپردیم: ماڵمان سپاردە دراوسێکەمان› ٢. کردنی کارێک لە کەسێک ویستن ‹به کدخدا سپرده بود که برایش گوسفند بخرد: بە کوێخای سپاردبوو مەڕی بۆ بکڕێ› ٣. *[ادبی]* بڕین؛ بەسەر بردن؛ تێپەڕاندن؛ تێپەڕکردن؛ گوزەراندن؛ قەرقەدانەدن؛ بگاردن؛ ڕابووڕین؛ ڕابارتن ‹راه سپردن: ڕێگە بڕین›. هەروەها: **سپردنی**

■ **صفت فاعلی: سپارنده** (ـ)/ **صفت مفعولی: سپرده** (سپێراو)/ **مصدر منفی: نَسپردن** (نەسپاردن)

**سپرده** / seporde، ـها/: *اسم.* سپارە؛ سپارتی؛ ئەسپاردە؛ سپوردە؛ سپەردە؛ سپاردە: ١. ئەوەی بۆ پاراستن بە لای کەس یان ڕیخراوەییکەوە بە ئەمانەت دادەنرێ ٢. پارەیەک کە لە حیسابێکی بانکی کەس یان ڕیخراوەیەک ڕادەگیردرێ ٣. بارمتە؛ پارە یان ماڵێک کە بۆ دەستەبەری یان بەڵێن بە جێبەجێ‌کردنی کارێک دەدرێتە لایەنێکی‌تر.

▣ **سپردەی بانکی** ☜ **سپرده ـ٢**

**سپردەی ثابت:** پارەیەک کە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بە لای بانکەوە دادەنرێ.

**سپردەی دیداری:** سپاردەیەک کە خاوەنەکەی دەتوانێ هەر کات بیەوێ وەری‌بگرێ.

**سپردەی قانونی:** پارەیێ کە ڕێخراوەیەک بە ناوی دەستبەری دەبێ بە بانکی ناوەندی بسپێرێ.

**سپردەگذاری** / sepordegozārî، ـها/: *اسم.* کاری سپاردنی پارە یان ماڵێک بۆ دەستەبەری ئەنجامدانی کارێک.

**سپرز** / seporz/: *اسم.* سپڵ؛ سەپەڵ؛ ئەسپووڵ؛ شمش؛ شوشو؛ خالخالک؛ دێدک؛ خوش‌خوشک؛ خوش‌خوشکە؛ گورگ‌نەخۆرە؛ پارچە گۆشتێکی ڕەشە لە هەناودا، خوێنی ساوای تێدا دروست بووە.

**سپری** / separî/: *صفت.* ١. بەسەرچوو؛ تێپەڕیو؛ بگاردی؛ بووردە؛ ڕابردە؛ ڕابردگ (لەمەڕ کاتەوە) ‹روزگار سپری: ڕۆژگاری بەسەرچوو› ٢. بە برانەوە؛ جێی تەواو بوون ‹جهان سپری: دنیای بە برانەوە›.

▣ **سپری شدن/ گشتن**: تێپەڕ بوون؛ تەواو بوون؛ کۆتایی هاتن؛ دوایی هاتن؛ بە سەر چوون؛ ڕابگاردن؛ تەمامیەی؛ هەرادیای ‹مهلت ثبت‌نام سپری شد: ماوەی ناونووسی تێپەر بوو›.

**سپری کردن**: تێپەڕکردن؛ بردنە سەر؛ دانە سەر؛ ماوەیەک بەسەر بردن؛ تەمامنەی ‹دوران سربازی را در کردستان سپری کرد: ماوەی سەربازیەکەی لە کوردستاندا تێپەر کرد›.

**سپس** / sepas/: *قید.[ادبی]* پاشان؛ دوایی؛ لەودوا؛ لەووەدوا؛ ئەمجار؛ ئەوجار؛ ئینجا؛ ئیمجا؛ دمایی؛ هەنی؛ دوای کارێ یان کاتێ ‹سپس گفت: «امروز وقت گذشته است»: پاشان وتی: «ئەمڕۆ کات بەسەرچووە»›.

**سپستان** / sepestān ، ـها/: *اسم.* سپسوو؛ سەپیەسوو: ١. دارێکی گەرمەسێریە بە گەلای بێ‌کولکی هێلکەیی، گولی سپی یان زەرد و بەری پێشەدارەوە ٢. بەری ئەو دارە کە ئەوەندەی گیلاسێکە و بۆ دەرمان دەشێ.

**سپلشت** / sepelešt/ ☜ **سەپلشت**

**سپلشگ** / sepelešg/ ☜ **سەپلشت**

**سپند** / sepand/: *اسم.* سداب؛ ئەسپەندەر؛ دیدی؛ قان؛ قانگ؛ گیای ئسپەند.

**سپوختن** / sepûxtan, supûxtan, sopûxtan/: *مصدر. متعدی.[ادبی]* // **سپوختی**: پوورانت؛ **می‌سپوزی**: دەپوورێنی؛ **بسپوز**: بپوورێنە// پووراندن؛ ڕاپۆڕاندن؛ (تێ)پەستاندن؛ (تێ)پەستاوتن؛ تێ‌برین؛ تەپاندن؛ (تێ)تەپاندن؛ (تێ)ئاخنین؛ تێپەست کردن؛ (تێ)کوتانن؛ تێ‌کوتان؛ تێ‌خونجان؛ (تێ)ترینجاندن؛ قرساندن؛ دەوساندن؛ هەزاندن؛ هەشاندن؛ هەشفاندن؛ ئەنەبریەی؛ ئەنەتەپنەی؛ ئەنەئاخەنەی؛ بە زۆر و پاڵە پەستۆ دە ناو شتێک ڕاکردن: **سپوزیدن**

■ صفت مفعولی: **سپوخته** (پووڕاو)/ مصدر منفی: **نَسپوختن** (نەپووڕاندن)

**سپور** / supûr, sopûr ، ـها؛ ـان/: [ترکی]/*اسم.* *[گفتاری]* پاکەوان؛ کۆڵان‌ماڵ؛ زبڵڕێژ؛ کەنناس؛ زبڵچی؛ سپوور؛ کرێکارێ کە کاری گەسک لێدان و ڕامالینی زبڵ و زوێڵ لە کۆڵان و دەرمالان و بە کورتی خاوێن‌کردنەوەی شارە ☜ **رفتگر**

**سپوزیدن**/ sepûzîdan, supûzîdan, sopûzîdan/ ☜ **سپوختن**

**سپوس** / supûs, sopûs ، ـها/: *اسم.* سوێ؛ سۆ؛ سۆس؛ کەپەک؛ کرپک؛ توێکلی دانەوێڵەی لە دەستاڕکراو کە لە دابێژراندا لە ئاردەکەی جوێ دەبێتەوە: **سبوس**

**سپه** / sepah/: *اسم.[مخفف]* سپا؛ سوپا.

**سپهبد** / sepahbod ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سپاپورد؛ سپابود؛ ئەفسەری بە پلەی سپاپوردی.

**سپهبدی** / sepahbodî/: *اسم.* سپابودی؛ سپاپوردی؛ پلەکی چەکداری باڵاتر لە سەرلەشکەری و خوارتر لە ئەرتەشبودی.

**سپهر** / sepehr/: *اسم.[ادبی]* ئاسمان؛ ئەزمان.

**سپهسالار** / sepahsālār/: *اسم.* سوپاسالار؛ سپاسالار؛ سەرکردەی هەموو لەشکر.

**سپید** / sepîd/: *صفت.[ادبی]* سپی؛ ئسپی؛ چەرمگ.

**سپیدائی** / sepîdā'î/ ☜ **سپیدایی**

**سپیدار** / sepîdār ، ـها؛ ـان/: [کردی]/*اسم.* سپیدار؛ ئەسپیدار؛ ئەسپندار؛ سپیندار؛ ئەسپیندار؛ هەوران؛ سپیەچنار؛ کوولەکەچنار؛ هەڤران؛ شاتان؛ ئەسپین؛ دارێکە لە تیرەی دارە بیان، بە تاجێکی باز و هێلکەیی، گەلای سپی لۆکەئاسا، چرۆی سپی و تاڵ‌ـتاڵ و جەوی نووسنەکەوە: **سفیدار**

**سپیده** / sepîde/: *اسم.* [کردی] *[ادبی]* سپێدە؛ سپیدە؛ زەردە؛ ڕووناکی کەمڕەنگی لای ڕۆژهەڵاتی ئاسمان بەر لە خۆر کەوتن.

▣ **سپیده دمیدن:** *[ادبی]* سپێدە دان؛ گەڤلین؛ بەیان ئەنگووتن؛ بەرەبەیان بوون؛ بوولێڵە پەیدا بوون؛ دیاری دانی ڕووناکی لە ئاسۆی خۆرهەڵاتدا بە نیشانەی سەرەتای ڕۆژ.

**سپیده‌دم** / sepîdedam/: *اسم.* *[ادبی]* سپێدە؛ سپیدە؛ سپێدەزوو؛ بەرەبەیان؛ بەربەیان؛ بەیانی؛ بەیانەکی؛ گەڤل؛ سیسان؛ کازیوە؛ کازوکووز؛ شەوەکی؛ گورگ‌ومێش؛ تاریک‌وڕوون؛ تاریک و لێڵە؛ بوولێڵەی بەیانی؛ کاتی دەسپێکردنی ڕۆژ؛ سەرەتای ڕۆژ.

**سپیده‌دمان** / sepîdedamān/: *قید.* *[ادبی]* کازێوان؛ بەیانان؛ دەمەو بەیان؛ لە کاتی بەیانیدا.

**سپیدی** / sepîdî/: *اسم.* *[ادبی]* سپیەتی؛ سپیایی؛ چەرمگی؛ چەرموایی؛ چەرمایی.

**ست** / set/: [انگلیسی] *اسم.* ١. ست؛ سەرجەم ‹ست کامپیوتر: ستی کامپیوتەر› ٢. دەست؛ دەس ‹این ظرفها ست است، تکی نمی‌فروشیم: ئەم دەفرانە دەستن، دانەیی نایانفرۆشین›.

▣ **ست کردن:** دەستەکردن؛ دەسەکردن؛ بە شێوەی سەرجەم یان دەست دەرهێنان.

**ـ ستا** / setā ، ـها؛ ـیان/: *پیواژه.* ـپەسن؛ پەسەن؛ پەسندەر ‹خودستا: خۆپەسن›.

**ـ ستائی** / setā'î/ ☜ **ـ ستایی**

**ستاد** / setād ، ـها/: *اسم.* ستاد: ١. ناوەند یان مەزرینگەیێ کە کاری بەرنامەڕێژی و وێکخستنی ناوەکی دامەزراوەیەکی وەئەستۆیە ٢. کۆمەڵەی کارگێڕانی ئەم ناوەندە.

**ستاره** / setāre ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* ئەستێرە؛ هەستێرە؛ ئەستێر؛ ستێر؛ ستێرە؛ ستەیر؛ ستارە؛ هەستارە؛ هەسارە؛ ئاسارە؛ ئاسیرە؛ ئاستێرە؛ چتارە؛ هەرین: ١. ئەختەر؛ هەر یەکە لە تەنگەڵی بەزریوەی ئاسمان کە لە کاتی شەودا دەبیندرێن ٢. ئەختەر؛ هەر یەکە لە تەنگەڵی ئاسمانی پێکهاتوو لە گازی بەتین و تیشکدەر ٣. نیشانە و دروشمێک بە شێوەی ئەستێرە (✻) ٤. ئەوەی بە شێوەی ئەستێرە لە کانزا یان شتێکی‌تر دروستی دەکەن (وەک ئەستێرەیێ کە لە پلەکی چەکداریدا بەکاردێ) ٥. *[مجازی]* دەورگێڕی بەناوبانگ؛ (هەسارەی سینەما، هەسارەی شانۆ، هەسارەی فووتبال) ٦. *[مجازی]* بەخت؛ هات.

▣ **ستاره‌ی داود:** ئەستێرەی داود؛ نەخشێک بە شێوەی ئەستێرەی شەش پەڕ، کە بۆتە دروشمی جوو.

**ستاره‌ی دنباله‌دار:** کلکەستێر؛ ئەستێرەی کشاو؛ هەر کام لە تەنگەڵی ئاسمانی بە سەرێکی وەک هەوری ڕۆشن بە دەوری ناوکێکی ڕووناکەوە کە بە دەوری خۆردا دەگەڕێن و کاتێ لە خۆر نزیک دەبنەوە، دوویەکی درەوشانیان لێ بەدی دێ: **ذوذنب**

**ستاره‌ی دوتایی:** دوو ئەستێرە؛ دوو ئەستێر؛ دووخوشکە؛ جووتەی کەوان؛ دوو هەسارەی پەنایەک، کە هێزی ڕاکێشانی نێوانیان بۆتە هۆی ئەوەی لە دەوری یەکتردا بخولێنەوە: **ستاره‌ی مزدوج**

**ستاره‌ی سحر(ی)** ☜ **ستاره‌ی صبح**

**ستاره‌ی سعد:** ئەستێرەی بەخت؛ ئەستێرە یان گەڕۆکێک کە وا دەزانن نمانای بەختن (وەک ناهید و هورمز).

**ستاره‌ی سهیل:** سوهیل؛ سیوەیل؛ ڕووناکترین ئەستێرەی وێنەی گەردوونی کەشتی لە لەتەگۆی باشووری ئاسماندا.

**ستاره‌ی صبح:** ناهی؛ ناهید؛ زل؛ ئەستێرە گەشە؛ قورخ؛ قورغ؛ ئەستێرکە؛ کاروان‌کوژە؛ کاروان‌کوژ؛ کارڤانکوژ؛ کاروانقڕان؛ مژمژ؛ زێڕگۆن؛ هەسارەی ڕۆژ؛ ئەستێرەی ڕۆژێ؛ ئەستێرەی زوهرە کە لە ئاخری شەودا

هەڵدێ: **ستارەی سحر(ی)**

ستارەی غول پیکر: ئەستێرەکەتە؛ هەر یەک لەو ئەستێرانەی کە ٢٠ تا ٣٠ بەرامبەر لە خۆر گەورەترن و زۆرتر لە ١٠٠ ئەوەندە رووناکترن.

ستارەی قطبی: جودەی؛ گەشترین هەسارەی کەلووی ورچی بچووک لە سەر جەمسەری باکووردا.

ستارەی کوتوله: ئەستێرەی گرگن؛ هەر یەکە لە ئەستێرەگەلی سپی کەم ترووسکەی گچکە بەلام تۆکمە.

ستارەی متغیر: هەر کام لەو ئەستێرانە کە لە ماوەیەکی دیاریکراودا لە پڕ تیشکیان زۆر دەبێ و پاشان بەرە-بەرە کەم دەبێتەوە.

ستارەی مزدوج ☜ **ستارەی دوتایی**

ستارەی نحس: ئەستێرەی شووم؛ ئەستێرە یان گەڕۆکێک کە وا دەزانن نمانای شوومین (وەک کەیوان و بارام).

ستارەی نوترونی: ئەستێرەی نوترونی؛ ئەستێرەیێکی زۆر تۆکمە و چڕە کە زۆرتر لە نوترون پێکهاتووە و بە هۆی هێزی کێشستی زۆرەوە بە هیچ فوتونێ رێ دەرچوون نادا و بەم بۆنەوە تاریکە.

▣ ستارەی سهیل شدن: *[مجازی]* بوونە گوڵەگەزیزە؛ بوونە قەنی ماڵەگەدا؛ کەم و درەنگ دەرکەوتن ‹ستارەی سهیل شده‌اید، دیگر نمی‌توان شما را دید: بوویتە گوڵەگەزیزەوە، کەس ناتانبینێ›.

ستارە شمردن: *[کنایی]* هەسارە ژماردن؛ شەوبێدار بوون؛ شەونخوونی کێشان.

ستارە نداشتن: *[مجازی]* ناوچاو نەبوون؛ بەخت نەبوون؛ هەسارەدار نەبوون.

**ستارەباران** / setārebārān/: *صفت. [ادبی]* ئەستێرەباران؛ هەسارەواران؛ پڕ ئەستێرە ‹آسمان ستارەباران بود: ئاسمان ئەستێرەباران بوو›.

**ستارەی دریایی** / setāreyedaryāyî ، ـگان دریایی/: *اسم.* ئەستێرەی زەریایی؛ گیانەوەری ئاوزی بە شێوەی ئەستێرە.

**ستارەسوخته** / setāresûxte/: *صفت. [مجازی]* چارەرەش؛ رۆژرەش؛ بەدبەخت؛ بەختکوێر.

**ستارەشناس** / setārešenās ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ١. ئەستێرەناس؛ ئەستێرەشناس؛ هەسارەناس؛ هەسارەژناس ٢. ئەستێرەگەر؛ ژمارەگەر.

هەروەها: **ستارەشناسی**

**ستاک** / setāk ، ـها/: *اسم.* ١. *[ادبی]* وەچ؛ گەشە؛ خەڵف؛ پۆ؛ سادیل؛ پەژیک؛ لقی تازە دەرهاتوو ٢. *[زبان‌شناسی]* رەگ؛ بنی کار.

**ـ ستان** / setān/: *پیواژە. [ادبی]* ـ ئەستێن؛ ـ ستێن؛ ـ سێن؛ ـ ستان؛ ـ سان؛ ـ ئەس؛ ـگر؛ سێنەر؛ بگر ‹جان‌ستان: گیان‌نەستین›.

**ـ ستان** / estān/: *پسوند.* ـ ستان؛ ـ سان؛ جێگە و شوێنی شتێ ‹گلستان؛ کوهستان: گوڵستان؛ کێوسان› شوێنی سەقامگیر بوونی نەتەوەیێک ‹کردستان: کوردستان›.

**ستاندن** / setāndan/: *مصدر متعدی. [ادبی]* // **ستاندی**: ستاندت؛ **می‌ستانی**: دەستێنی؛ **بستان**: بستێنە// ستاندن؛ ئەستاندن؛ وەستاندن؛ سەندن؛ سەنن؛ ساندن؛ سەنین؛ ستەندن؛ وەرگرتن؛ سانەی؛ سانای؛ ئەسەی؛ ئەسای؛ ئەستەی؛ ستانای؛ گرتنی شتێک لە دیتری: **ستدن**. هەروەها: **ستاندنی**

■ **صفت فاعلی: ستاننده** (سێنەر)/ **صفت مفعولی: ستانده** (سێنراو)/ مصدرمنفی: **نَستاندن** (نەستاندن)

**ـ ستانی** / setānî/: *پیواژە.* ـ سێنی؛ ـ ئەستێنی؛ ـ ستێنی؛ ـ سانی؛ سەنین؛ ئەستاندن ‹باج‌ستانی: باج‌سێنی›.

**ستاوند** / satāvand/: *اسم. [معماری]* ١. شوێنێکی سەرداگیراوی بێ‌دیوار کە میچەکەی تەنیا بە سەر چەند ئەستوونەوە دامەزراوە (وەک ئارامگای حافیز لە شیراز) ٢. سەکۆیەکی بەرز کە بە سەر

چەن کۆڵەکەوە دروستکراوە.

**ستایش** / setāyeš ، ـها/: *اسم.* پەسن؛ پاسین؛ ستایشت؛ ڕەوش؛ کاری هەڵگوتن؛ پێدا هەڵدان.

▣ **ستایش کردن:** پەسن کردن؛ ستایشت کردن؛ هەڵگوتن؛ پێدا هەڵدان؛ پۆرە چنیەی.

**ستایش آمیز** / setāyešāmîz/: *صفت.* پەسناوی؛ تێکەڵاو لەگەڵ پەسندا؛ وێرای ڕەوش.

**ستایش‌انگیز** / setāyešangîz/: *صفت.* پەسن‌بزوێن؛ خاوەن توانایی یان تایبەتمەندی بزواندنی پەسن.

**ستایشگر** / setāyešgar ، ـان/: *اسم.* پەسن‌دەر؛ پەسنکەر؛ تاریفدەر؛ بوێژی چاکی کەس یان شتێک ‹بسیاری ستایشگر نوشته‌های او بودند: زۆرێک پەسن‌دەری نووسراوەکانی بوون›.

**ـ ستایی** / setāyî/: *پیواژە.* ـ پەسنی؛ ـ پەسەنی؛ هەڵگوتن ‹خودستایی: خۆپەسنی› **ـ ستائی**

**ستبر** / setabr ، ـها/: *صفت. [ادبی]* ئەستوور؛ ستوور؛ ستویر؛ زۆپ؛ کەت؛ قەپە؛ قەبە؛ جەبلە؛ قالەن؛ قەوی؛ کولوفت؛ بەگرتک ‹گردن ستبر: ملی ئەستوور›.

**ستبرا** / setabrā/: *اسم. [ادبی]* ئەستوورایی؛ ستوورایی؛ قەویایی؛ زۆپی؛ کولوفتی.

**ستبربازو** / setabbāzû/: *صفت. [ادبی]* ساقۆڵ قەوی؛ مەچەک ئەستوور؛ خاوەن باسکی ستوور و بەهێز.

**ستبرسینه** / setabrsîne/: *صفت. [ادبی]* سینەپان؛ خاوەن سنگی زۆپ و پان.

**ستبری** / setabrî/: *اسم.* ئەستووری؛ ڕیس؛ ڕەوق: ۱. دۆخ یان چۆناوچۆنی ئەستوور بوون ۲. ئەستوورایی؛ کولوفتی؛ قەویایی.

**ستدن** / setadan/ ☜ **ستاندن**

**ستر** / setr/: [عربی] *اسم. [ادبی]* پۆشش؛ پۆشەن.

▣ **ستر عورت:** کاری خۆ داپۆشین؛ شەرم داپۆشین.

**ستردن** / setordan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**ستردی:** سڕیتەوە؛ **می‌ستری:** دەسڕیەوە؛ **بستر:** بسڕەوە// ۱. سڕینەوە؛ ئەسترینەوە؛ ئەسترین؛ سڕین؛ ڤەسڕین؛ سەڕتەی؛ هەشڤاندن؛ هەشڤاندن؛ هەشڤین؛ شتێک لە شوێنێک پاک کردنەوە ‹اشک ستردن: فرمێسک سڕینەوە› ۲. تاشین؛ تراشین؛ تاشەی؛ تاشای؛ تاشتەی. هەروەها: **ستردنی**

■ صفت مفعولی: **سترده** (وەسڕاو)/ مصدر منفی: **نَستردن** (نەسڕینەوە)

**سترگ** / setorg/: *صفت. [ادبی]* ۱. مەزن؛ مازن؛ گەپ؛ گەم؛ گەورە؛ زل؛ زۆپ؛ گەورە؛ قەبە ‹پهلوان سترگ: پاڵەوانی مەزن› ۲. گرنگ؛ خاوەن بایەخ.

**سترون** / setarvan/: *صفت. [ادبی]* ۱. نەزۆک؛ ئەستێور؛ ستێور؛ ستەور؛ خرش؛ قسر؛ قرد؛ بەیچەڵ؛ بەبێ توانایی زاوزێ یان زۆر بوونەوە ‹زن سترون: ژنی نەزۆک› ۲. بژون؛ پاقژ؛ پاکژ؛ بێ ترس لە بەدیهاتنی هۆکارگەلی نەخۆشیهێن ‹محیط سترون: دەڤەری پاقژ›. هەروەها: **سترونی**

**سترون‌سازی** / setarvansāzî/: *اسم.* ۱. نەزۆکسازی؛ کاری لە زگ‌وزا خستن یان خەساندنی گیانەوەر ۲. کار و چارێ کە بۆ سڕینەوەی پیسی لە ئاقارێک دەکرێ.

**سترونی** / setarvanî/: *اسم.* ۱. نەزۆکی؛ ئەستێوری؛ ستێوری؛ قسری؛ بەیچەڵی؛ خرشی ۲. بژونی؛ پاکژی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بژون بوون.

**ستم** / setam ، ـها/: *اسم. [ادبی]* ستەم؛ ستەو؛ گووج؛ زینات؛ زۆر؛ زوور؛ ناهەقی؛ زڵم؛ بێداد؛ کاری ناڕەوا بۆ ئازاندنی کەسێک.

▣ **ستم دیدن:** چەوسانەوە؛ چەوسینەوە؛ ستەم لێ کران؛ ستەم دیتن؛ چەوسێنران؛ وە بەر ئازاری ناحەقی کەوتن ‹مردمی کە سالها ستم دیدند و دم بر نیاوردند ...: ئەو خەڵکە وا زۆر ساڵان

چەوسانەوە و دەنگیان دەرنەدەهات...›.

**ستم رسیدن:** ستەم پێ‌گەیشتن؛ ستەم لێ‌چوون؛ ئازار یان گەزن دیتن بە هۆی ستەمەوە ‹از او به مردم ستم بسیار رسید: لەوەوە، ستەمی زۆر بە خەڵکی گەیشت›.

**ستم روا داشتن:** چەوساندنەوە؛ ستەم ڕەوا دیتن؛ ستەم‌کردن.

**ستم کردن:** چەوساندنەوە؛ چرووساندنەوە؛ ستەم‌کردن؛ ئەرناندن؛ ئەنراندن؛ بە ناڕەوا دیتری ئازار دان و مافی پێشێل‌کردن ‹او به مردم کردستان ستم بسیار کرد: ئەو خەڵکی کوردستانی زۆر چەوساندەوە›.

**ستم کشیدن:** چەوسانەوە؛ چەوسینەوە؛ ستەم چێژتن/ چێژان؛ ستەم‌کێشان؛ بەر کردەوەی ستەمکار کەوتن و هەڵکردن دەگەڵ ستەمیدا ‹این همه ستم کشیدن بس نبود؟: ئەم هەموو چەوسانەوە بەس نەبوو؟›.

**ستمدیده** / setamdîde ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* چەوساوە؛ چەوسێنراو؛ زۆرلێ‌کراو؛ لە ستەم ئازراو ‹مردم ستمدیده: خەڵکی چەوساوە›.

**ستمشاهی** / setamšāhî/: *اسم.* دەسەلاتی شایی وێڕای زۆر.

**ستمکار** / setamkār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* چەوسێنەر؛ ستەمکار؛ گووج‌کار؛ زاڵم؛ زیناتکار؛ زۆرکار. هەروەها: **ستمکاری؛ ستمکارانه**

**ستمکش** / setamkeš ، ـها؛ ـان/: *صفت.* چەوساوە؛ چەوساو؛ ستەمکێش؛ وە بەر کردەوەی ستەمکارکەوتوو.

**ستمکشی** / setamkešî/: *اسم.* چەوساوەیی: ۱. دۆخ یان چۆناوچۆنی ستەمکێش بوون ۲. کارەڕەهاتی لە ژێر باری ستەمدا بوون.

**ستم‌کشیده** / setamkešîde ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* چەوساوە؛ چەوساو؛ زۆر لێ‌کراو؛ ستەم لێ‌کراو ‹مادر ستم‌کشیده: دایکی چەوساوە›.

**ستمگر** / setamgar ، ـها؛ ـان/: *صفت.* چەوسێنەر؛ مارز؛ مارس؛ زۆردار؛ ستەمکار؛ ستەمگەر؛ خاوەن خووی ناهەقی کردن؛ دەست درێژکەر بۆ مافی ڕەوای خەڵک.

**ستمگرانه** / setamgarāne/: *صفت.* چەوسێنەرانە؛ ستەمکارانە؛ ستەمگەرانە ‹رفتار ستمگرانه: ئاکاری ستمکارانە›.

**ستمگری** / setamgarî ، ـها/: *اسم.* ستەمگەری؛ ستەمکاری: ۱. بار یان دۆخی ستەمگەر بوون ۲. کارەڕەهاتی ستەم‌کردن؛ چەوساندن.

**ستنبه** / setanbe, setambe/: *صفت.[قدیمی]* زل؛ زلام؛ زەلام؛ گەپ؛ قەڵەوە؛ گەورە؛ ئەستوور ‹شیر ستنبه: شێری زل›.

**ستوان** / sotvān, setvān ، ـها/: *اسم.* ستوان؛ سوتوان؛ ئەفسەرێ بە پلەکی ستوانی، ژووری ئوستواری و خواری سەروانی، کە سەرکردەیی لقێکی چەکداری وە ئەستۆە. هەروەها: **ستوان سوم، ستوان دوم، ستوان یکم**

**ستوانی** / sotvānî, setvānî/: *اسم.* ستوانی؛ پلەکی ئەفسەری لە هێزی چەکداری ئێراندا، خوارتر لە سەروانی.

**ستودان** / sotûdān, sutûdān/ ☜ **أستودان**

**ستودن** / sotûdan, sutûdan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **ستودی:** پەسنت‌دا؛ **می‌ستایی:** پەسن دەدەی؛ **بستا(ی):** پەسن‌دە// پەسن‌دان؛ هەڵگوتن؛ هەڵدان؛ هەڵنان؛ ئەڤاختن؛ ستایشت‌کردن؛ وتنەوەی چاکە و هەڤیازیگەلی چاوگری کەس یان شتێک. هەروەها: **ستودنی**

■ صفت فاعلی: **ستاینده** (پەسندەر)/ صفت مفعولی: **ستوده** (پەسن‌دراو)/ مصدر منفی: **نَستودن** (پەسن نەدان)

**ستوده** / sotûde, sutûde ، ـگان/: *صفت.[ادبی]* باش؛ چاک؛ شیاو؛ لەبار؛ پەسندراو؛ شیاوی پێدا هەڵگوتن.

**ستور** / sotûr, sutûr/: *اسم.[ادبی]* یەکسم؛ پاکێش؛ دەوار؛ دەوێر؛ وڵاخە بەرزە؛ بەرزە وڵاخ؛

چاروێ، بەتایبەت ئەسپ و هێستر و کەر.

**ستون** / sutûn, sotûn ، ـها/: اسم. ئەستون؛ ئەستوون؛ ستون؛ ستوون؛ سوون؛ ستوین؛ هەستون؛ هەسوون؛ ئەستوونە؛ ستوونە؛ ئەستوندەک؛ ئەستۆنگ؛ ئەستوند؛ ستینک: ١. کۆڵەکە؛ کۆڵەکێ؛ لەی؛ دیلەک؛ دیرەک؛ دیرەگ؛ گاوە؛ پێکهاتەیەکی وەستاو لە کانزا، چێو یان بەرد بۆ ڕاگرتنی میچ کە دەدرێتە ژێری ‹ستون وسط اتاق ترک برداشته بود: کۆڵەکەی ناو دیوەکە قەڵشابوو› ٢. کۆڵەکە؛ کۆڵەکێ؛ لەی؛ قولە؛ جزر؛ چەلەگە؛ پێکهاتەیەکی وەستاو لە بەرد یان چێوی داتاشراو و زۆرتر گرۆڤەری کە بە سەر پایەیێکەوە دادەمەزرێ و بە سەریەوە سەر ستوونێک هەیە ٣. کۆڵەکە؛ هەر چێک وەکوو ئەستوون بێ ٤. *[چاپ]* ڕیزێک نووسراوە لە ژێر یەکتری و لە پاڵ ڕیز یان ڕیزگەلی‌تردا ‹ستون روزنامه: ستوونی ڕۆژنامە› ٥. *[نظامی]* ڕیز؛ گرۆیەک لە کەسان و گەڕۆکان کە بۆ چوونە جێگایەک دەکەونە پشت سەر یەکەوە ٦. هەر یەکە لە ڕیزگەلی ئەستوونی خشتە یان دەفتەری حیساب ٧. *[مجازی]* کۆڵەکە؛ پشتیوان؛ پاڵپشت ‹ستون خانواده بودن: ئەستوونی ماڵ بوون›.

▣ **ستون اعزامی:** شاندی چەکداری؛ هێزی چەکداری کە بۆ جێبەجێ‌کردنی کارێک ڕەوانە دەکرێ. هەروەها: **ستون امدادی؛ ستون تدارکاتی**

**ستون آگهی:** کۆڵەکەی ئاگاداری؛ ستوونی ئاگاداری؛ ئەستوونێک لە داوێنی بوارگەیەکدا، بۆ داکوتانی ئاگەداری.

**ستون پنجم:** *[مجازی]* ستوونی پێنجەم؛ شۆڤاران و ئەوانەی پەنامەکی بۆ دوژمن کار دەکەن. ئەو دەستەواژەیە لە سەردەمی قەومانی شەڕە ناوخۆییەکانی سپانیا (١٩٣٩ بەرەو دوا)دا باو بوو، کاتێ کە چوار ستوون لە لایەنگرانی ژنراڵ فرانکۆ بەرەو مادرید (پاتەخت) پێشڕەوییان دەکرد، سەردارەکەیان گوتی: «جگە لەم چوار ستوونە، ستوونی پێنجەمیشمان هەیە کە لە ناو مادرید بە قازانجی ئێمە دەجووڵنەوە». لەو کاتەوە ئەم زاراوەیە چووە نێو سیاسەتەوە و بەم مانایە بەکاردێ.

**ستون تهویه:** پێکهاتەیەکی قیتی هەڵۆڵ بۆ هەوا گۆڕانی فازلاو.

**ستون فقرات:** مۆرەغە؛ مۆرخە؛ مرۆخە؛ مورتخە؛ مۆرتخە؛ مورەتخە؛ پشتەمازە؛ بڕبڕە؛ بڕبڕاگە؛ گازەرا؛ گەوبەندە؛ گەوبەندە؛ مازگە؛ مازی؛ مازە؛ گارگارە؛ سنسل؛ بڕبڕاگی؛ تەرختە؛ مووڕێ؛ کرک؛ ناقدەرگ؛ دۆڕپشت؛ مۆرە/ مازە/ کاریتە/ گازی/ ناوەڕاست/ مورک/ ماری/ بڕبڕەی/ مرۆخەی/ موڤکا / ستوونا / تیغەرەی پشت؛ ترەختە/ تیغەڵە/ کاریتە/ تیلەقە/ تیرەقی/ تیرەقە/ ترەختەی پشتی.

**ستون مهره** ☜ **ستون فقرات**

**ستون یادبود:** بینا یان پارچە بەرد، خشت یان ئاسنێک بە شێوەی گرۆڤەر یان چوارپاڵوو کە شتێکی بۆ بیرەوەری بە سەردا نووسرا بێ.

▣ **ستون زدن:** کۆڵەکە دان؛ دیلەک دان؛ تیرەک دان؛ دامەزراندنی ئەستوون دە ژێر شتێکدا.

**ستون کردن:** دانە ژێر؛ کردنە کۆڵەکە؛ کردنە ئەستوون؛ وەرقلاندن؛ شتێک ڕاستەو کردن و لە ژێر شتێکی‌تردا دانان.

**ستون‌بندی** / sutûnbandî, sotûnbandî/: اسم. ئەستوونرێژی؛ کار و ڕەوتی هەڵوەژارتن و بەڕیز کردنی ڕزنی هەر شتێک ‹ستون‌بندی روزنامه مغشوش است: ئەستوونرێژی ڕۆژنامەکە شێواوە›.

**ستونی** / sutûnî, sotûnî/: صفت. ئەستوونی؛ کۆڵەکەیی: ١. وەکوو ئەستوندەک؛ وەک کۆڵەکە ٢. ئەستووندار؛ کۆڵەکەدار.

**ستوه** / sutûh, sotûh/: *اسم.* وەڕەزی؛ جاڕزی؛ ماندوویەتی و لەدەس‌دانی هێز و برست بۆ درێژە دان بە تێکۆشان.

▣ به ستوه آمدن: *[ادبی]* وە زاڵە هاتن؛ جڕ هاتن؛ تەنگەتاو بوون؛ دامان؛ هەراسان بوون؛ یاس بوون؛ وەڕەز بوون؛ جاڕز بوون.

به ستوه آوردن: جڕکردن؛ یاس کردن؛ تەنگەتاوکردن؛ ماندووکردن؛ هەراسان کردن؛ جاڕزکردن؛ وە زاڵە هێنان.

**ستوهانیدن** / sutûhānîdan, sotûhānîdan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* تەنگەتاوکردن؛ وە زاڵە هێنان؛ هەراسان‌کردن؛ هەفاندن؛ وەڕەز کردن؛ماننەی؛ مانای؛ جاڕز کردن؛ وەستاندن؛ ماندوو- مردووکردن.

**سته** / sete/: *صفت. [گیاه‌شناسی]* گۆشتن؛ نابشکاف و بە یەک یان چەن دەنکەوە (لەمەڕ میوەگەلی وەک ترێ و تەماتە).

**ستیز** / setîz/: *اسم. [مخفف]* شەڕ؛ جەنگ؛ سواژ؛ سواش؛ کێشە؛ هەلا؛ هۆملکێ؛ مرخێش؛ سەربندۆ ‹ستیز و گریز: شەڕ و هەلات‌هەلات›.

**ستیزه** / setîze ، ـها/: *اسم. [ادبی]* مشت‌ومڕ؛ مرومشت؛ سواش؛ سواژ؛ جەنگەمرینگێ؛ کێشە؛ بەرەنگاری؛ پاڵوو؛ بەربەرەکانێ؛ داوا؛ هەڤرۆشی؛ خروجر؛ شەڕ و هەرا.

▣ ستیزه کردن: مشت‌ومڕکردن؛ مرومشت کردن؛ جەنگ کەردەی؛ ستێزەکردن؛ تێک بەربوون؛ داواکردن؛ شەڕکردن: **به ستیزه برخاستن** *[ادبی]*

به ستیزه برخاستن ☜ **ستیزه کردن**

**ستیزه‌جو** / setîzecû ، ـها؛ ـیان/: *صفت. [ادبی]* شەڕانی؛ شەڕاشۆ؛ جینگن؛ جەنگ‌خواز؛ وەیخڕ؛ مقەرس؛ شەڕفرۆش؛ زڕەک؛ پلەندەر؛ نەقەنۆ؛ سەرنەوق؛ دەم‌سوور؛ شڕ و دڕ؛ بە کێشە و ناساز؛ خاوەن حەز بە شەڕ و پێک‌دادان. هەروەها: **ستیزه‌جویی**

**ستیزه‌گر** / setîzegar ، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* دەگژڕاچۆ؛ تێکهەڵچۆ؛ مرومشت‌کەر؛ شەڕانی؛ شەڕاشۆ؛ قرووش؛ خاوەن خوو یان حەز بە شەڕ کردن. هەروەها: **ستیزه‌گری**

**ـ ستیزی** / setîzî/: *پیواژه.* ـ سواژی؛ ـ سواشی؛ ـ بەلشی؛ چۆنیەتی بەرەنگاری کردن لەگەڵ شتێکدا ‹فرهنگ‌ستیزی: فەرهەنگ‌سواژی›.

**ستیزیدن** / setîzîdan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* //**ستیزیدی**: شەڕت کرد؛ **می‌ستیزی**: شەر دەکەی؛ **بِستیز**: شەڕ بکە// شەڕ کردن؛ جەنگ کردن؛ بە شەڕ هاتن؛ بەلشین؛ بەرزاندن؛ گژیەی؛ گژیای؛ ستێزای؛ بەربەرەکانێ کردن. هەروەها: **ستیزیدنی**

■ صفت فاعلی: **ستیزنده** (شەڕکەر)/ صفت مفعولی: **ستیزیده** (شەڕکردوو)/ مصدر منفی: **نَستیزیدن** (شەڕ نەکردن)

**ستیغ** / setîq ، ـها/: *اسم. [ادبی]* ۱. چووک؛ لاشاخ؛ لاشان؛ تیغەشان؛ سەر شان؛ سەر یاڵ؛ یاڵە؛ سەرقەل؛ کاوان؛ تەلان؛ تەلان؛ بەندەن؛ ملە؛ بستی؛ کەل؛ بانترین شانی بەرزاییێ ۲. سەرکاو؛ سەرکەل؛ چلەپۆپە؛ زینو؛ بستو؛ ترۆپک؛ کۆپ؛ قولە؛ چک؛ پۆپە؛ لووتکە؛ دوند؛ نووک؛ سەر نووک؛ گل.

**ستیهندگی** / setîhandegî/: *اسم. [ادبی]* تووشی؛ پلەندەری؛ جینگنی؛ نۆیی؛ شەڕاشۆیی؛ زڕەکی؛ وەیخڕی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تووش بوون.

**ستیهنده** / setîhande ، ـگان/: *صفت. [ادبی]* تووش: ۱. شەڕاشۆ؛ پلەندەر؛ نەقەنۆ؛ جینگن؛ زڕەک ۲. توورە؛ قەلس؛ کەسکین؛ کەسکون؛ تونە مەزاج.

**ستیهیدن** / setîhîdan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* کێشە و هەرا کردن؛ چنگاوش بوون؛ ڕەهەستن؛ ڤەگڤزین؛ جەنگەمرینگێ کەردەی؛ نۆیین؛ شەڕ و قاڵ کردن.

**سجاده** / saccāde ، ـها/: [عربی] *اسم.* بەرماڵ؛

جانمـاز؛ جارمـاز؛ دوگـرد؛ دووگـرد؛ شـەملک؛ چالک؛ مازلۆخ؛ سوجایە؛ ڕایەخێ کە نـوێژی لـە سەر دەکەن.

**سجاف** / secāf، ـها/: [عربی]/اسم. قارِنج؛ زنجـاف؛ سنجاف؛ کەنارە؛ کۆبە؛ باریکـە قوماشـێ کـە بـۆ ئەستوور و پتەو کردن بـە پـەراوێز یـان لێـواری ناوەکی جل و بەرگەوە (وەک سەرقۆل، پێـسیر یـا ملیوان) دایدەگرن.

**سجایا** / sacāyā/: [عربی] جمعِ ☜ **سَجیّه**

**سجده** / sacde, secde, socde، ـها/: [عربی]/اسم. سوژدە؛ شردە: ١. *[اسلام]* لە هێمەکانی نوێژ کـە بریتیە لە نانەسەر زەوینی حەوت ئەندام (تەوێڵ، دوو لەپی دەست، دوو ئـەژنۆ، دوو پەنجـەی پـێ) و خوێندنـەوەی ڕستەسـایەکی دۆعـایی ٢. هـەر کارێکی وەکوو سوژدە.

⊡ **سجده کردن:** سـوژدە بـردن؛ سـوژدەکردن؛ هەنی نانـە سـەر زەوی بـۆ نیـشاندانی ڕێـز و خاکەساری.

**بـە سـجده رفـتن:** چوونـە سـوژدەوە؛ سـوژدە ئەنجام دان.

**سـجع** / sac'/: [عربـی]/اسـم. *[ادبـی]* ١. سـەجع؛ ئاهەنگ و کێشی وتە (وەک «گۆڕ» و «سەرشـۆڕ» لە ڕستەی «پیاو لاشەی لە ناو گور بێ، نەک بمێنێ و سەرشۆڕ بێ») ٢. *[قـدیمی]* گمـە؛ گومـە؛ گـم؛ گـوم؛ گمـەگم؛ گومـەگوم؛ دەنگـی کـۆتر و گوگوختێ.

**سجل** / secel(l)، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسـم. پێناسـە؛ ناسنامە؛ سـجیل؛ بەڵـگەیێ کـە نـاو و نیـشانی کەسێکی تێدایە.

**سـجود** / sucûd, socûd/: [عربـی]/اسـم. *[ادبـی]* سوژدە؛ کاری سوژدە بردن.

**سجیه** / sacîyye، سجایا/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* خدە؛ خوو؛ گەد؛ ڕەوشت.

**سحاب** / sahāb/: [عربی]/اسم. *[نامتـداول]* ١. بـۆق؛ هەڵم؛ هەپ ٢. هەور؛ هەڤر؛ عەور؛ ئەور؛ ئەورە.

**سحابی** / sahābî، ـها/: [عربی]/اسـم. *[نجـوم]* هـەر یەکە لـە کۆمـا درۆشـنەکانی وەک هـەور یـان تـەمئاسـا لـە ئاسمانـدا، کـە شـەوانی سـاماڵ دەردەکەون.

**سحار** / sahhār/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* ئەفسوونکار؛ نێرەنگباز؛ سیحراوی.

**سـحر** / sahar، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. سـەحەر: ١. بەرەبەیان؛ دەمەو بەیان؛ شەوەکی زوو؛ سـەر سـۆ؛ بـەیانی؛ سـەلای سـۆح؛ بـەربانگ؛ مـەلا بانگدان ٢. پارشێو؛ پارشەو؛ دواکاتەکانی شـەو، پێش ڕوون بوونەوەی هەوا.

**سحر** / sehr، ـها/: [عربی]/اسم. نێرەنـگ؛ جـادوو؛ سیحر؛ ئەفسوون؛ کەڵەک؛ فەن؛ تەڵەکە؛ مـەکر؛ چاچۆڵ؛ فێڵ.

⊡ **سحر خواندن:** جەلجەلووت وتن؛ فەن و فـوو خوەندن؛ سیحر خوێندن.

**سحر کردن:** فەن و فووکردن؛ سیحرکردن؛ لە سۆنگەی ئەفسوونەوە کەسـێ یـا شـتێک بـە دۆخێک دەرهێنان. هەروەها: **سحر شدن**

**سحر آسـا** / sehrāsā/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. سیحرئاسـا؛ جادووئاسـا؛ ئەفـسوونئاسـا؛ وەک جادوو؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی جادووییەوە.

**سـحرآمیز** / sehrāmîz/: [عربـی/ فارسـی] صفت. ئەفسووناوی؛ سیحراوی: ١. ئەفسوونکار؛ تێکەڵاو بـە سـیحر و جـادوو ٢. *[مجـازی]* هەژەنـد؛ سەرسووڕێنەر؛ زۆر سەیر و بەلاجـەوی ‹سخنان سحرآمیز: قسەگەلی ئەفسووناوی› ❋ **سحرانگیز**

**سـحرانگیز** / sehrangîz/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **سحرآمیز**

**سـحرخیز** / saharxîz، ـهـا؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی] *صفت.* زووڕاب؛ زووخێز؛ سەحەرخێز؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە زوو لە خەو ڕابوون.

**سـحرخیزی** / saharxîzî/: [عربـی/ فارسـی]/اسم. زووڕابی؛ زووخێزی؛ کاری زووهەستان لە خەوی بەیانی.

**سحرگاه / sahargāh** ، ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. */ادبی/* دەمەوبەیان؛ دەمدەما؛ بوولێڵەی بەیان؛ سپێدەدەم؛ کاز و کووز؛ کازیوە؛ کاتی بەیانی.

**سحرگاهان / sahargāhān**/: [عربی/ فارسی] قید. */ادبی/* دەمەوبەیانان؛ بوولێڵەی بەیانان؛ لە کاتی دەمەو بەیاندا.

**سحرگاهی / sahargāhî**/: [عربی/ فارسی] صفت. دەمەو بەیانی؛ سپێدەیی؛ سەر بە دەمەو بەیان ‹نسیم سحرگاهی: شنەی دەمەوبەیانی›.

**سحری[1] / saharî**/: [عربی]/اسم. پاشێو؛ پارشێو؛ پارشەو؛ ساگوور؛ نانی بەرەبەیانی رۆژگەوان ‹امروز بی‌سحری روزه گرفتم: ئەمرۆ بێ‌پارشێو رۆژووم گرت›.

**سحری[2]**: صفت. دەمبەیانی؛ بەرەبەیانی؛ دەمسبەینان؛ پێوەندیدار یان بەندیوار بە بەرەبەیان ‹ستارەی سحری: ئەستێرەی دەمبەیانی›.

**سحری[3]**: قید. */گفتاری/* دەمەوبەیان؛ پاشام؛ لە کاتی بەرەبەیاندا ‹سحری بیدار شدم: دەمەوبەیان وەخەبەر هاتم›.

**سحور / sahûr**/: [عربی]/اسم. */ادبی/* سحری ☜ **سحری[1]**

**سخا / saxā**/: [عربی]/اسم. */ادبی/* دلاڤایی؛ دلاوایی؛ دەسبازی؛ دەسبلاوی؛ بەخشندەیی؛ دەهندەیی.

**سخافت / saxāfat**/: [عربی]/اسم. */ادبی/* نەزانکاری؛ کەمئاوەزی؛ کەمژەیی؛ گێلی؛ گەوجی؛ حۆلی؛ گێژی؛ وڕی؛ دۆخ یان چۆنیەتی گێژ و حۆڵ بوون.

**سخاوت / sexāvat, saxāvat**/: [عربی]/اسم. ئادا؛ دلاڤایی؛ دلاوایی؛ شاخسی؛ دەس‌ودڵبازی.

**سخاوتمند / sexāvatmand, saxāvat-** ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. کەرەمکار؛ دەهندە؛ بەخشندە؛ جوامێر؛ نان‌دە؛ نان‌بدە؛ کەرەمدار؛ خواردە؛ دەس‌ودڵباز؛ خۆشنان؛ دلاوا؛ شاخس؛ سەخاوەتمەند.

**سخت[1] / saxt**/: صفت. ۱. سەخت؛ زەب؛ ڕەق؛ زوها؛ گوژم؛ گژ؛ چەق؛ هشک؛ هێشک؛ پتەو؛ سفت؛ بە خۆڕاگری زۆر لە هەمبەر لێدان یان گوشارەوە ‹چوب سخت: چێوی سەخت› ۲. ئارێشە؛ سەخت؛ حەستەم؛ ئاستەم؛ دژوار؛ ئاستەنگ؛ سەخڵەت؛ گران؛ ئاسێ؛ ئاسێهـ ؛ هاسێ؛ دوخشار ‹کار سخت؛ زندگی سخت: کاری سەخت؛ ژیانی ئارێشە› ۳. تیژ؛ تێژ؛ سەخت؛ تون؛ توند؛ تن؛ بە تەوژم ‹باران سخت: بارانی تیژ› ٤. */گفتاری/* چەق؛ نمرچ؛ لاسار لە سەودادا ‹تو چقدر سخت هستی!: تۆ چەندە چەقی!›.

▣ **سخت بودن**: سەخت بوون؛ گران بوون: ۱. ڕەق بوون؛ زەب بوون؛ زوها بوون؛ گوژم بوون؛ خۆ ڕاگر بوونی زۆر لە بەرانبەر لێدان و تەوژمەوە ‹مثل سنگ سخت بود: وەکوو بەرد سەخت بوو› ۲. ئاستەم بوون؛ حەستەم بوون؛ دژوار بوون؛ هاسێ/ ئاسێ بوون ‹کار خیلی سخت بود: کارەکە زۆر ئاستەم بوو›. هەروەها: **سخت شدن؛ سخت کردن**

**سخت کسی آمدن/ بودن**: پێ‌گران بوون؛ بۆ کەسێک سەخت بوون؛ بۆ کەسێک حەستەم بوون؛ وەنەو یۆی سەخت ئاما؛ بۆ کەسێک دژوار یان دڵنەخواز بوون ‹سختت می‌آمد بیایی حالی از من بپرسی؟: پێت گران بوو بهاتبای هەواڵێکت لە من پرسیبا؟›.

**سخت گذراندن**: ئاستەم بردنە سەر؛ تاڵ چوون؛ سەخت دانەسەر؛ گران بگاردن؛ سەخت ویاردەی؛ بە ژاری و دژواری و وێڕای ڕەنج و پەژارە ژیان دانەسەر ‹آن سال را در خارج سخت گذراندیم: ئەو ساڵەمان لە هەندەران ئاستەم بردە سەر›.

**سخت گذشتن**: ئاستەم تێپەڕین؛ سەخت گوزەران؛ سەخت ویەردەی؛ سەردەمێ بە دژواری و ژاری بە سەر چوون.

**سخت گرفتن**: سەخت گرتن؛ پێداگرتن؛ لاساری کردن؛ سەختگری کردن؛ پادانە گەز.

**سخت**[2]: *قید.* پیس؛ سەخت؛ زۆر؛ خراو؛ ئاستەم؛ بە حەستەم ‹سخت خشمگین شد: پیس توورە بوو›.

**سخت ـ**[3]: *پیشواژە.* سەختـ؛ سەختەـ: ١. ڕەقـ؛ زەبـ؛ خاوەن ڕەقی یان پتەوی ‹سختپوست: ڕەقپێست› ٢. بە گژ و گوژمە ‹سختکوش: سەختکۆش›.

**ـ سخت**[4]: *پیواژە.* ـ سەخت؛ ـ ڕەق؛ ـ گران؛ ـ پتەو؛ ـ هەسەم؛ بە ڕەقی یان زەبی ‹جانسخت؛ سرسخت: گیانسەخت؛ سەرڕەق›.

**سختافزار** / saxtafzār ، ـها/: *اسم.* سەختامێر: ١. لەتە و پاژگەلی ئیلیکترۆنیکی و میکانیکی کەمپیوتەر ٢. لەتە و دەزگاگەلی کانزایی ماشین ٣. جەنگامێرگەلی کانزایی ٤. ئامێرگەلی فێرکاری (وەک ویدیۆ؛ زەبت، گرام و...).

**سختپا** / saxtpā/: *صفت.* خۆگر؛ بنەجێ و نەگۆڕ لە بەرامبەر هۆکارگەلی دەرەکییەوە (وەک دەما، لێدان، گوشار). هەروەها: **سختپایی**

**سختپوست**[1] / saxtpûst ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ڕەقپێس؛ سەختپێست؛ هەر یەکە لە گیانەوەرانی تیرەی ڕەقپێستان کە زۆربەیان لە ئاودا دەژین و قاپیکی پتەویان پێوەیە (وەک قرژاڵ).

**سختپوست**[2]: *صفت.* پێست ڕەق؛ پۆس کوڵۆفت؛ کەوڵ سەخت؛ خاوەن پێستی پتەو.

**سختجان** / saxtcān/ ☜ **جانسخت**

**سختجانی** / saxtcānî/ ☜ **جانسختی**

**سختدل** / saxtdel/ ☜ **دلسخت**

**سختسر** / saxtsar/ ☜ **سرسخت**

**سختشامە** / saxtšāme/: *اسم. [کالبدشناسی]* سەختەکاژی؛ ڕەقەکاژی؛ شانەی پێوەندی پتەو کە مێشک و مۆخی مۆرغەداران دادەپۆشێ و ڕەگی خوێنی تێدایە.

**سختکام** / saxtkām/ ☜ **سختکامە**

**سختکامە** / saxtkāme/: *اسم. [کالبدشناسی]* ئێسکەمەلاژ؛ سەختەمەلاژ؛ ڕەقەمەلاژ؛ بەشی بەرەوەی مەلاژگ کە لە دوو لەتە ئێسک بە ناوی ئێسکی مەلاژ پێکهاتووە: **سختکام**

**سختکوش** / saxtkûš ، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* تێکۆشەر؛ خاوەن خوو یان هۆگرەتی زۆر بە تێکۆشان.

**سختکوشی** / saxtkûšî ، ـها/: *اسم.* تێکۆشەری؛ داکۆکی و کۆششی زۆر.

**سختگیر** / saxtgîr/: *صفت.* سەختگر؛ توند و تیژ؛ بەزاکوون؛ سەختگیر؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە سەختگیری ‹مدیر سختگیر: بەڕێوەبەری سەختگر›.

**سختگیرانە**[1] / saxtgîrāne/: *صفت.* سەختگرانە؛ بەزاکوونانە؛ توند و تیژانە؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی سەختگیریەوە ‹تدابیر سختگیرانە: تەگبیرگەلی سەختگرانە›.

**سختگیرانە**[2]: *قید.* سەختگرانە؛ بەزاکوونانە؛ توند و تیژانە؛ هاوڕێ لەگەڵ سەختگیریدا ‹سختگیرانە عمل میکند: سەختگرانە کار دەکا›.

**سختگیری** / saxtgîrî ، ـها/: *اسم.* سەختگری؛ سەختگیری: ١. کار یان ڕەوتی هەڵپێچانی خەڵک بە: *الف)* کارگەلی دژوار *ب)* هەڵکردن لە بار و دۆخی دژواردا *ج)* چاوبڕی ورد و توند لە سیستەم، دەستوور یان قانوون ‹پدرم نسبت بە من خیلی سختگیری میکرد: بابم لە ئاست من زۆر سەختگری دەکرد› ٢. بەزاکوونی؛ پێداگری؛ داکۆکی زۆر، بەتایبەت لە شۆنگری و پێداگری لە سەر قانوون، دەستوور یان بەرنامە ‹امسال در مدرسە خیلی سختگیری میکنند: ئەمساڵ لە قوتابخانەدا زۆر سەختگری دەکەن›.

**سختی**[1] / saxtî/: *اسم.* ١. ڕەقی؛ هێشکایی؛ سەختی؛ زەبی؛ گژی؛ گوژمی؛ سفتی؛ پتەوی؛ گرانی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەخت بوون ‹بە سختی سنگ: بە ڕەقی بەرد› ٢. /ـها/ سەختی؛

دژواری؛ ئاســـتەمی؛ ئاســـتەنگی؛ حەســـتەمی؛ سەخڵەتی؛ تەنگاوی؛ دوخشاوی؛ تەنگی ‹سختی کشیدن: سەختی کێشان› ۳. [مکانیک] پتەوی؛ خۆڕاگری؛ هەندی خۆڕاگری شتێک لە هەمبەر بیچم‌گۆڕانەوە ٤. قورسی؛ دۆخی هەبوونی ماکی کانی لە ئاودا ‹سختی آب: قورسی ئاو›.

▣ **سختی دادن**: ئازاردان؛ سەخت لێ گرتن؛ خستنە تەنگانە/ تەنگیەوە؛ ڕەنج و زەحمەت پێدان ‹خیلی به بچه‌ها سختی داد، آنها را گرسنه نگه می‌داشت: منداڵەکانی زۆر ئازار دەدان و برسی دەیهێشتنەوە›.

سختی دیدن ☜ **سختی کشیدن**

سختی کشیدن: سەختی‌کێشان؛ تەنگی کێشان؛ تاڵ و سوێری چێشتن ‹تا بزرگ شدند، سختی کشیدند: تا گەورە بوون سەختیان کێشا›:

**سختی دیدن**

ـ **سختی**[2]: *پیواژە.* ـ سەختی؛ هەبوونی خۆڕاگری و بەردەوامی ‹جان‌سختی: گیان‌سەختی›.

**سختی‌سنج** / saxtîsanc ، ـها/: *اسم.* ۱. سەختی‌پێو؛ ئامرازێک بۆ ئەندازەگرتنی سەختی کانزا و ماکی تر ۲. قورسی‌پێو؛ کەرەستە یان ئامێرێک بۆ پێوانی قورسی ئاو.

**سخره** / soxre/: [عربی]/*اسم.[ادبی]* ۱. تەوزە؛ تیتاڵی؛ گاڵتە؛ قەڵمەری؛ قەشمەری؛ ڕشخەن؛ کاری تەوزە پێ‌کردن: **سخریه** ۲. بێگاری؛ بێگار؛ سوخرە؛ سۆژە؛ سوغرە؛ زەود؛ کاری بەزۆر.

▣ به سخره گرفتن: گاڵتە پێ‌کردن؛ بە گاڵتە گرتن/ زانین؛ بە تیتاڵی گرتن؛ بە گەمەگرتن؛ تەوزە پێ‌کرن؛ بە شۆخی گێرتەی؛ بە فشەگرتن؛ بە تەشقەنەگرتن؛ ڕشخەن پێ کردن؛ گرتنە گەمەجاڕ ‹او مرگ را به سخره می‌گرفت: گاڵتەی بە مردن دەکرد›.

**سخریه** / soxrîyye/: [عربی] ☜ **سُخره**

**سخن** / soxan ، ـها؛ ـان/: *اسم.[ادبی]* ۱. قسە؛ قسیە؛ قسێ؛ قەسە؛ پەیڤ؛ پەیف؛ واتە؛ وتە؛ گفت؛ گپ؛ گلی؛ گوتە؛ وشە؛ وشە یان ڕستەگەلێ کە بۆ دەربڕینی مەبەست دەگوترێن ۲. [مجازی] هەڵبەست؛ هۆنراوە؛ شیعر؛ شیعرە؛ هۆزان.

▣ **سخن راندن**: وتار/ گوتار دان؛ وتار وێژان؛ دوان؛ قسەکردن؛ وتوو؛ دوەی؛ دوای ‹او دربارەی آزادی سخن می‌راند: لەمەڕ ئازادیەوە وتاری دەدا›.

**سخن گفتن**: قسەکردن؛ قسیەکردن؛ ئاخافتن؛ ئاخاوتن؛ ئاخەفتن؛ ئاخفتن؛ پەیڤین؛ قسە کەردەی؛ قسێ‌کەردەی؛ واتش.

**به سخن درآمدن**: هاتنە قسە؛ هاتنە زمان؛ بە قسە هاتن؛ بە وتار هاتن؛ دەس بە وتن‌کردن؛ ئامایرە قسێ؛ دەس بە قسەکردن ‹وقتی به سخن درامد، همه چشم به او دوختند: کاتێ هاتە قسە، هەموان چاویان لێ بڕی›.

**سخن‌پراکنی** / soxanparākanî ، ـها/: *اسم.[ادبی]* کار و ڕەوتی قسە بڵاوکردنەوە.

**سخن‌پرداز** / soxanpardāz ، ـها؛ ـان/: *اسم.[ادبی]* ۱. وتەبێژ؛ گوتەبێژ؛ زمان‌تەڕ؛ قسەزان ۲. شاعیر؛ هۆنەر؛ هۆزانڤان.

**سخن‌چین**[1] / soxančîn ، ـها؛ ـان/: *اسم.[ادبی]* دووزمان؛ قسەهێن؛ قسەبەر؛ شووفار؛ شۆفار؛ نێوان تێکدەر؛ کەسێ کە قسە و باسی کەسێک بەبێ ویستی ئەو کەسە، بۆ کەس یان کەسانی‌تر دەبا ‹سخن‌چین خود آسایشی ندارد: دووزمان بۆ خۆی لە تەناهی دوورە›.

**سخن‌چین**[2]: *صفت.* تێچێن؛ قسەبەر؛ شووڤار؛ شۆفار؛ شەیتانی‌کەر؛ خەبەرگوهێز؛ قسەڕاگوێز؛ چوول؛ چولەئاشوو؛ بەکرۆک؛ وات‌وات؛ قسەهێن؛ قسەهەڵچن؛ بەزاخ؛ بەزاجکەر؛ خاوەن خوو یان ئۆگرەتی بە دووزمانی ‹سخن‌چین این ماجرا، آرام بود: تیچن لەم کارەساتەدا ئارام بوو›.

**سخن‌چینی** / soxančînî ، ـها/: *اسم.* دووزمانی؛ دووزوانی؛ زمان‌شڕی؛ زارشڕی؛ قسەهەڵچنی؛

قسەهێنی؛ قسەبەری؛ بەزاج؛ شۆفاری؛ شەیتانی؛ کار یان ڕەوتی گوتنەوەی قسە و باس بە مرازی نێوان تێکدان.

**سخندان** / soxandān ، ـها؛ ـان/: صفت. قسەزان؛ دەمڕاست؛ زمانپاراو؛ دەمـاوەر؛ وتـەپاراو؛ قسە ڕەنگـین؛ وێـژا: ۱. خـاوەن زانـست لـە بـواری وێژەوانی بەتایبەت شیعردا ۲. تەڕزوان؛ تەڕدەم؛ بـە گفـت و لفـت؛ بـەدەم؛ دەم هـەراش؛ بـەدەمودوو؛ دەمپـاراو؛ خـاوەن توانـایی بـاش قسەکردن. هەروەها: **سخندانی**

**سخنران** / soxanrān ، ـها؛ ـان/: اسم. وتـاربێژ؛ بێژەر؛ وتاردەر؛ گوتۆخ؛ پەیفگۆ؛ کەسـێ کـە بـۆ گرۆیەکی بیسەر لـە کـۆڕێکی فەرمیـدا لەمـەڕ بابەتێکەوە قسە دەکا ‹سخنران در پایان مـردم را بـە آرامش و تفاهم دعوت کرد: بێژەر لە ئاکامـدا، خەڵـکی بەرەو هێمنی و لێکگەیشتوویی بانگ کرد›.

**سخنرانی** / soxanrānî ، ـها/: اسم. وتـار؛ گۆتـار؛ گفتار؛ وتاربێژی؛ کار یـان ڕەوتی قـسەکردن بـۆ گرۆیەکی بیسەر، زۆررتر لە کـۆڕێکی فەرمیـدا و لەمەڕ بابەتێکی تایبەتەوە.

▣ **سخنرانی کردن**: دوان؛ وتاردان؛ مروکیـایش؛ وتاربێژی کردن.

**سخنسرا** / soxansarā ، ـیان/: اسم. *[ادبی]* شاعیر؛ هۆنەر؛ هۆزانڤان.

**سخنسرایی** / soxansarāyî ، ـها/: اسم. *[ادبی]* هۆزانـڤانی؛ شـاعیری؛ کـاری شـیعر هۆنینـەوە؛ هەڵبەستن؛ شیعر دانان.

**سـخنسـنجی** / soxansncî ، ـهـا/: اسـم. ۱. ڕەخنـــەی وێژەیـــی؛ ڕەوتی لێـــڕوانین و تۆژینـــەوەی تایبەتمەندیگـــەلی جوانکـــاری و بایەخی هۆنەری بەرهەمێکی وێژەیی؛ ڕەخنـەی ئـەدەبی ۲. وتـەوانی؛ قـسەزانی. هـەروەها: **سخنسنج**

**سـخنشـناس** / soxanšenās ، ـها؛ ـان/: صفت. قسەناس؛ وتەناس؛ پەیڤناس؛ خاوەن توانایی لە لێکدانەوە هەڵسەنگاندن و دەرخستنی بایـەخی وێژەیـی وتەیـەک ‹او مـردی سـخنشناس بـود و می‌دانست این سخن از کجاست: پیـاوێکی قـسەناس بوو، دەیزانی ئەم وتـە لـە کوێـوە دێ›. هـەروەها: **سخنشناسی**

**سـخنگو**[1] / soxangû ، ـهـا؛ ـیـان/: اسـم. بێـژەر؛ وێژەر؛ وتـەبێـژ؛ وتـەوات؛ قـسەکەر؛ قـسیەکەر؛ دەمڕاسـت؛ کەسـێ کـە لـە لایـەن گـرۆ یـان دامەزراوەیێکـەوە، لەمـەڕ کـار و بـار یـان خواسـتەکانیانەوە قـسە دەکـا ‹سـخنگوی تظاهرکنندگان در مصاحبە با خبرنگاران گفت:... بێژەری خۆپیـشاندەران لـە وتوویـژ لەگـەڵ هەواڵـدەراندا گوتی:...›.

**سخنگو**[2]: *صفت.* قسەکەر؛ وتـەوان؛ وێـژەر ‹مرغ سخنگو: مەلی قسەکەر›.

**سـخنور**[1] / soxanvar ، ـان/: اسـم. *[ادبـی]* هەڵبەستوان؛ شاعیر؛ هۆنەر؛ هەستیار؛ شایەر.

**سخنور**[2]: *صفت. [ادبی]* دیوانـدڕ؛ قـەل؛ قـسەزان؛ دەمپاراو؛ دەماوەر؛ زوانپـاراو؛ لێهـاتوو لـە بـاش قسەکردندا.

**سـخنوری** / soxanvarî ، ـهـا/: اسـم. *[ادبـی]* ۱. قسەزانی؛ دەماوەری؛ دۆخ یا چۆنیەتی جوان قسە کردن ۲. شاعیری؛ هەستیاری.

**سـخی** / saxî/: [عربـی] *صـفت. [ادبـی]* دەهنـدە؛ بەخـشندە؛ دلاوا؛ بـەدڵ؛ دەسـتڤـەکری؛ دەستکراوە؛ دەستودڵباز؛ بـەرچاوتێر ‹سخی و بلند همت بود: دەهندە و بەرزەمژی بوو›.

**سخیف** / saxîf/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ۱. ـان/ *[نامتداول]* بەیتەشە؛ کـەمئـاوەز؛ لاژگ؛ سـاویلکە ۲. گەوجانە؛ لاژگانە؛ نەفامانـە؛ گێلانـە؛ حۆلانـە ‹عمل سخیف: کاری گەوجانە›.

**سد** / sad(d) ، ـها/: [عربی] *اسم.* ۱. سەد؛ ئاوبەند؛ بەند؛ بەربەنـد؛ بەربـەن؛ وەن؛ بـەروەن؛ بەنـداو؛ بەربەست؛ بەربەس؛ کەرپە؛ بەرەگە؛ پێشبەست؛ لەمپەرێ کـە وە بـەر ئـاوی گـەڕۆک (بەتایبـەت

چەم) دەخرێ تا لای بدا یان بەشێکی لێ گلداتەوە ۲. کار یان ڕەوتی بەستن؛ ڕێ گرتن ‹یک هفته است، بهمن راه را سد کرده: حەوتوویکە هەرەس ڕێگای بەستووە› ۳. [مجازی] لەمپەر؛ بەرگر؛ گەپل؛ بەرهەڵست؛ ڕتم ‹سد راه ترقی: بەسەری ڕێی پێشکەوتن›.

▣ سد انحرافی: بەندی ئاو ڕاگوێز؛ بەربەندێ کە بۆ هێنانە سەرەوەی ئاو و گواستنەوەی دروستکراوە.

سد جوع: [ادبی] کار یا ڕەوتی بەر برسیەتی گرتن؛ لابردنی برسیەتی؛ برسیەتی شکاندن؛ برسیەتی نەهێشتن؛ ئاوراییێ کۆشتەی؛ بەر برسیەتی گرتن ‹هر روز با یک قرص نان سدجوع می‌کرد: هەموو ڕۆژێ بە تاقەنانێک بەر برسیەتی دەگرت›.

سد سکندر: [کنایی] بەربەست یان بەرهەڵستی ئاستەم و پتەو.

سد مخزنی: بەربەندێ کە زرێوارێ لە پشتیەوە بۆ نیاتەکردنی ئاو و بەرهەمهێنانی کارەبا پێکهاتووە.

▣ سد بستن: بەربەند بەستن؛ بەند دابەستن؛ بەربەند قایم کردن؛ بەند دروستکردن.

سد راه کسی شدن: [مجازی] ڕێ لە کەسێ برینەوە؛ بوونە لەمپەری ڕێگای کەسێک؛ بەر بە ڕێگەی کەسێ گرتن؛ بوونە بەرهەڵستی کەسێک؛ بەر بە ڕۆیین یان پێشکەوتنی کەسێک گرتن.

سد کردن: بەستن؛ بەربەست کردن؛ بەند کردن؛ بەربەندکردن؛ بینەی؛ بینتەی؛ هلبەستن؛ هەڵبەستن ‹در آنجا راه دشمن را سد می‌کردند: لەوێدا ڕێگایان بە دوژمن دەبەست›.

سد معبر کردن: ناو ڕێ گرتن؛ ڕێ بەستن؛ وەرە ڕا گێرتەی؛ بەر ڕێ گرتن؛ ناو دەس و پا گرتن؛ بەر بە هاتوچۆ گرتن بە هۆی کار و پیشەوە ‹دستفروشان در آنجا سد معبر کرده بودند: دەسفرۆشان لەوێدا ناوڕێیان گرتبوو›.

**سداب** / sodāb ، ـها/: /اسم/ نەرمیلێ؛ پێچن؛ پێچە؛ پێچی؛ پێچێ؛ هەرمەڵ؛ گیایەکی ئالیکی پایا، بە بۆنێکی تیژ و ناخۆش، گەڵای ئەستوور و گۆشتنەوە کە بۆ دەرمان دەشێ.

**سدر** / sedr/: /اسم/ کونار؛ کونار؛ کینار؛ زەرک؛ سیتر؛ نەبگ؛ تەعەو: ۱. دارێکی گەرمەسێری بە گەڵاگەلی گچکە و کەسکی وەک کاجەوە ۲. وردەگەڵای وشکەڵاتووی داری کونار کە لە ئاودا کەف دەکا و سەر و لەشی پێدەشۆن.

**سدس** / sods/: [عربی] /اسم/ [ادبی] شەش یەک؛ یەک لە شەش؛ شەش یەکێ.

**سده** / sade/: /اسم/ سەدە: ۱. جێژنێکی کۆنی ئێرانە لە شەوی دەی ڕێبەنداندا کە بە دایساندنی ئاگر بە ڕێوە دەچێ ۲. سەتە؛ سەدسال؛ چەرخ؛ یەکەی زەمان بەرانبەر بە سەد ساڵ.

**سدید** / sadîd/: [عربی] صفت. [ادبی] پتەو؛ بتەو؛ پەیت؛ گوریخ؛ قایم ‹سد سدید: بەندی پتەو›.

**سدیم** / sod(i)yom/: [انگلیسی/ فرانسوی] /اسم/ سودیوم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ۱۱ و کێشی ئەتومی ۲۲٫۹۸، بە ڕەنگی زیو، نەرم و بێبەرگە کە خێرا لە هەوادا ئۆکسیدە دەبێ و لە دەمایەکی خواردا دەشکێ و لەگەڵ ئاودا تێکەڵ دەبێ: **ناتریۆم**

**سر** [1] / sar/: /اسم/ سەر: ۱. بەشی ژووروی جەستەی گیاندار لە ملەوە بەرەو بان ۲. /ـها/ کەللە؛ سەرە؛ سەلک؛ سەلگ؛ سەرک؛ بەچک؛ بانترین پاژی لەش لە گوێوە بەرەو بان ‹سرش شکست: سەری شکا› ۳. سەرەتا؛ دەسپێک؛ هەوەڵ؛ کەبار. بەرانبەر: **ته** ‹از این سر تا آن سر: لەم سەر تا ئەو سەر› ٤. نووک؛ سەرە؛ بەشی دوایی ‹سر سوزن: سەرە دەرزی› ٥. سەرە؛ زارەوانە؛ دەم؛ داپۆش ‹سر چاه: سەرەی بیر› ٦. یەکەی بژاردنی گیانداران ‹هفت سر عایله: پنج

سر گوسفند: حەوت سەر خێزان؛ پێنج سەر پەز› ٧. *[گفتاری]* قژ؛ قژێ؛ مووی سەر ‹سرم را تراشید: سەرمی تاشی› ٨. *[مجازی]* ژیان؛ ژین ‹سرش را به باد داد: سەری بە بادا› ٩. *[مجازی]* بیر؛ ناو مێشک ‹نمی‌دانم در سرش چه می‌گذرد: نازانم چی لە سەریدایە› ١٠. *[مجازی]* نیاز؛ قەست؛ ویست؛ مراز ‹سر جنگ داشتن: بە نیازی شەڕ بوون› ١١. *[ان//مجازی]* سەرەک؛ سەرۆک ‹سر قبیله: سەر هۆز› ١٢. نووک؛ چلەپۆپە؛ پۆپە؛ سەراون؛ گل؛ سەرەقەد؛ بەرزترین شوێنی بەرزاییەک ‹سر کوه: سەری کێو› ١٣. لچ؛ لچ؛ لێوارە؛ پەراوێز؛ قەراخ ‹سر آستین: سەر باسک› ١٤. لا؛ ئالی؛ پەڕ ‹آن سر میدان: ئەو سەری مەیدان› ١٥. *[گفتاری]* هەڤجیاوازی نرخی شتێک ‹ساعتم را دادم، هزار تومان هم سر دادم، این یکی را گرفتم: سەعاتەکەم دا، هەزار تمەنیشم نایە سەری، ئەمەم وەرگرت› ١٦. (لە تێکەڵاوی لێکدەردا) *الف)* هاوکاری ‹سر و کار: سەر و کار› *ب)* ڕێکوپێکی ‹سر و سیما؛ سر و سامان: سەر و پۆتراک؛ سەر و بەر›.

⊡ **سر بینه** ☜ **بینه**

**سر پاکت:** سەری پاکەت؛ دەرکی پاکەت؛ لێواری پاکەت کە بە سەر لێوارەکەی‌تریدا قەد بووە.

**سر پل:** سەری پرد؛ سەروو پردێ: ١. دەم پرد؛ سەرەتای پرد ٢. دەور و بەری پرد.

**سر چراغ:** سەر شەو؛ سەرەتای شەو؛ چراکەران؛ هەوەڵی شەو؛ دەم نشێوان.

**سر دل:** *[گفتاری]* سەر دڵ؛ بان دڵ؛ سەروو دڵی؛ گەدە، بەتایبەت بەشی سەرەوەی.

**سر زانو:** سەر چۆک؛ سەر زرانی؛ سەر ئەژنۆ؛ سەر زەنگۆڵ؛ کلاوەژنۆ؛ کلاوەی وژنگ؛ کەشکەک؛ دەرپەڕیوی ئەژنۆ.

**سر تا سر** ☜ **سراسر**

**سر خانه** ☜ **سرخانه**

**سر خود** ☜ **سرخود**

**سر گذر:** چەن ڕێیان؛ جێگای یەک گرتنەوەی چەن ڕێگە.

**سر نخ:** *[کنایی]* سۆسە؛ سووسە؛ شوێن یان ڕێنجی شتێک.

⊡ **سر آمدن** ☜ **به سر آمدن**

**سر آوردن:** ١. ☜ **به سر آوردن** ٢. *[تعریض]* بۆ ئاگر هاتن؛ زۆر بە پەلە هاتن ‹صبر کن! مگر سرآورده‌ای؟: سەبر کە! مەگەر بۆ ئاگر هاتووی؟›.

**سر از پا نشناختن:** *[مجازی]* جێ بە خۆوە نەگرتن؛ پێ لە عەرز نەکەوتن؛ پا زەوی نەگرتن باڵ دەرهێنان؛ سەرِ هاتن ‹از خوشحالی سر از پا نمی‌شناخت: لە خۆشیانا جێی بە خۆوە نەدەگرت›.

**سر از تخم درآوردن:** ١. سەر لە هێلکە دەرهێنان/ جووقاندن؛ سەرەتای دەرهاتنی جووچک لە هێلکە ٢. *[کنایی]* بای باڵ دان؛ بە خۆدا هاتن؛ گەورە بوون ٣. *[کنایی]* دەم بۆی شیر دان؛ مناڵ و کاڵ بوون.

**سر از تن کسی جدا کردن:** سەری کەسێک بڕین/ پەڕاندن/ ژێ کردن؛ سەر لە ملی کەسێ کردنەوە؛ ملی کەسێک هەڵکێشان.

**سر باز زدن:** *[مجازی]* سەربزێوی کردن؛ سەر هەڵێنان؛ بە قسە نەکردن؛ ملپێچکێ کردن؛ نافەرمانی کردن؛ نەچوونە ژێر فرمان؛ خۆ بواردن لە ئەنجامدانی کارێ ‹سربازان از فرمانش سر باز زدند و از میدان جنگ گریختند: سەربازەکان لە فەرمانی سەربزێویان کرد و لە مەیدانی شەڕ هەڵاتن›.

**سر باز کردن:** دەم‌کردنەوە؛ دەم بازکردن؛ دەمەوەکەردەی؛ کرانەوەی زاری شتێک ‹زیر پایش چاهی سر باز کرد: لە ژێر پێیدا چاوانەیێک دەمی کردەوە›.

**سر بر آسمان افراشتن/ سودن:** *[ادبی]* سەر لە ئاسمان سوان: ١. سەر گەیشتنە هەوران؛ هەوابڕ بوون؛ زۆر بڵیند بوون ٢. سەر

گەیشتنە ئاسمان؛ هەست بە سەربەرزی کردن.

**سر برآوردن:** سەر هەڵێنان؛ سەر هەڵهێنان؛ سەرە هۆربڕنەی؛ سەر هلانین: ۱. سەر بەرزکردنەوە؛ سەر بەرزەوەکردن ۲. *[کنایی]* خۆ دەرخستن؛ وێ وسەی سارا؛ سەر هێنانە دەر؛ سەر بەر ئاردەی؛ خۆ پیشاندان.

**سر برداشتن** ☜ **سر بلند کردن ـ۳**

**سر بردن:** ۱. ☜ **به سر بردن** ۲. *[تعریض]* کفن بۆ مردوو بردن؛ بۆ ئاگر هاتن؛ بە پەلە ڕۆیشتن ‹مگر داری سر می‌بری؟ این قدر عجله برای چیست؟: مەگەر کفن بۆ مردوو ئەبەی؟ ئەو هەموو پەلەیەت لە چیە؟›.

**سر بلند کردن:** سەر بەرز کردن/ کردنەوە: ۱. سەر هەڵبڕین؛ سەر هەڵێنان؛ سەرە هۆربڕنەی ‹سر بلند کرد و به او نگریست: سەری بەرز کردەوە و بۆی ڕوانی› ۲. *[کنایی]* سەر هەڵێنان؛ سەر بڵندکردن؛ شانازی‌کردن ‹مرا پیش مردم سربلند کردی: منت لای خەڵکەوە سەربەرز کرد› ۳. *[مجازی]* سەر بەرزکردنەوە؛ سەر بڵندکردنەوە؛ ڕاپەڕین؛ شۆڕش‌کردن ‹اگر کسی سر بلند می‌کرد، کشته می‌شد: ئەگەر کەسێ سەری بەرز بکردایەتەوە، دەکوژرا›: **سر برداشتن**

**سر به تن کسی نبودن:** *[مجازی]* سەری کەسێ بوونە ژێر لاشەیەوە؛ مردن یان کوژرانی کەسێ ‹می‌خواهم سر به تنت نباشد!: دەمەوێ سەرت ببیتە ژێر لاشەتەوە›.

**سر به جهنم زدن:** *[تعریض]* باری کەر نەکران؛ ئێجگار زۆر و نەگونجاو بوون ‹حساب این پولها سر به جهنم می‌زند: حەسێبێ ئەم پارەیانە، باری کەر ناکرێ›.

**سر به چیزی زدن:** بە شتێک گەیشتن؛ شان لە شتێکەوە دان؛ لەگەڵ شتێکدا بەرامبەر بوون ‹ثروت او سر به میلیونها می‌زند: داراییەکەی بە ملیونان دەگا›: **سر زدن ـ ۴**

**سر به زمین گذاشتن:** سەر نانەوە؛ سەرەوە نیەی: ۱. خەوتن؛ خەفتن؛ نووستن ‹تا سرم را به زمین گذاشتم، صدای تلفن بیدارم کرد: تا سەرم ناوە، زرەی تەلەفوون خەبەری کردمەوە› ۲. *[کنایی]* مردن؛ کۆچی دوایی‌کردن ‹فردا که سرت را زمین گذاشتی دولت همه چیزت را ضبط می‌کند: سبەی سەرت نایەوە، دەوڵەت هەموو شتێکت داگیر دەکا›.

**سر به سر کسی گذاشتن:** *[مجازی]* سەر نانە سەر کەسێک: ۱. گەپ و گاڵتەکردن بە کەسێ؛ سەرکردنە سەر کەسێکەوە؛ سەر خستنە سەر کەسێک؛ مل بیایش ‹داشتیم سر به سرت می‌گذاشتیم، دلخور نشو: سەرمان دەنایە سەرت، مەیگرە دڵ› ۲. سەر و مێشک تێکدان؛ کەسێک ئازار دان.

**سر به فلک کشیدن:** *[مجازی]* بە ئاسماندا هەڵکشان؛ لە ئاسمان ڕۆچوون؛ هەوابڕ بوون؛ یەکجار بەرز بوونەوە ‹گرداگرد دره، کوهها، سر به فلک کشیده بودند: دەوراندەوری دۆڵەکە، کێوەکان بە ئاسماندا هەڵکشابوون›.

**سر به کوه و بیابان گذاشتن:** *[کنایی]* سەر خۆ هەڵگرتن؛ دان بە کەژ و کێودا؛ بەرەو چۆڵی دوور لە خەڵک هەڵاتن ‹از دست تو سر می‌گذارم به کوه و بیابان: لە دەس تۆوە، سەر خۆم هەڵدەگرم›.

**سر به گریبان بودن:** *[مجازی]* دەس بە ئەژنۆ بوون؛ دەستەزرانی بوون؛ پەنجە هەڵپێکان؛ خەفەت خواردن یان بیر کردنەوە ‹سر به گریبان بود و نمی‌دانست چه کند: دەس بە ئەژنۆ بوو، نەیدەزانی چ بکا›.

**سر بی‌آب تراشیدن:** *[کنایی]* تەون دانە دەسەوە؛ بوونە هۆی ئازار و دەردیسەر.

**سر بی‌شام زمین گذاشتن:** بە سکی برسی سەرنانەوە؛ سەر بێ شێو نانەوە؛ بەبێ شێو خەوتن ‹پول نداشتیم و سر بی شام زمین

می‌گذاشتیم: پاره‌مان نه‌بوو، به زکی برسی سه‌رمان ده‌ناوه›.

**سر بی‌صاحب تراشیدن**: *[مجازی]* کاری بێ کارانه‌کردن؛ له سه‌د ئاش کردن و له یه‌کیان نه‌مالینه‌وه؛ کاری بێهۆکردن ‹این کارها برایت نان و آب نمی‌شود، با این مقاله‌ها سر بی صاحب می‌تراشی: ئه‌م کاره نابێته نان و ئاو بۆت، به‌م وتارانه کاری بی‌کارانه ده‌که‌ی›.

**سر پیچیدن**: *[مجازی]* نافه‌رمانی کردن؛ بێ‌قه‌ولی کردن؛ سه‌ربزێوی کردن؛ سه‌ربادان؛ به قسه نه‌کردن؛ سه‌رپێچی کردن؛ مل نه‌دان: ☜ **سرپیچی**

**سر تسلیم فرود آوردن**: مل دان؛ سه‌ر دانه‌واندن؛ گوێ رایه‌ڵ بوون ‹در برابر استدلالهای او سر تسلیم فرود آورد: له هه‌مبه‌ر به‌ڵگه‌هێنانه‌وه‌کانیدا ملی دا›.

**سر تغار کسی پایین رفتن**: *[تعریض]* قۆڕه‌ی مه‌شکه ڕه‌ش که‌سێ هه‌ڵسان؛ قۆڕه‌ی سک که‌سێک هاتن؛ برسی بوون.

**سر تیشه را بند کردن**: *[کنایی]* چنگ گیردان؛ بۆ خۆ هۆی داهاتی درێژخایه‌ن و به زیانی دیتری دۆزینه‌وه.

**سر چیزی باز شدن**: سه‌ری شتێک کرانه‌وه/ کریانه‌وه؛ سه‌ری شتێ باز/ واز بوون: ۱. هه‌ڵته‌کیان؛ ئاوه‌ڵا بوونی ده‌رکی شتێ ‹سر قوطی باز شد: سه‌ری قوتووه‌که کرایه‌وه› ۲. *[گفتاری]* ده‌ستپێکردنی شتێک ‹سر صحبت باز شد: سه‌ری قسه کرایه‌وه›. هه‌روه‌ها: **سر چیزی را باز کردن**

**سر چیزی را گرفتن**: سه‌ری شتێک گرتن؛ گرتنه ده‌سته‌وه‌ی ئاخری شتێک ‹سر میز را بگیر ببریم بیرون: سه‌ری مێزه‌که بگره بیبه‌ینه ده‌روه›.

**سر چیزی را هم آوردن**: ۱. سه‌ر شتێ هێنانه یه‌ک؛ ده‌م شتێ هاوردنه‌وه؛ جه‌م کردنه‌وه‌ی سه‌ری شتێ ‹سر کیسه را هم بیار و با نخ ببند: سه‌ر کیسه‌که بینه یه‌ک و به به‌نێک بیبه‌سته› ۲. *[مجازی]* شتێ برینه‌وه؛ کۆتا کردن؛ به‌س‌کردن؛ دوایی هێنان به دۆخ یان کارێک و به‌رگری کردن له درێژه پێدانی ‹دیدم فایده ندارد، زود سر بحث را هم آوردم: دیتم بێخۆه، زوو قسه‌که‌م بریه‌وه›.

**سر حرف را باز کردن**: *[مجازی، گفتاری]* سه‌ری قسه داهێنان/ داخستن؛ سه‌ر قسه داهاوردن/ داخستن ‹با خدمتکار خانه سر حرف را باز کردم: له‌گه‌ڵ خزمه‌تکاری ماڵدا سه‌ری قسه‌م داهێنا›. هه‌روه‌ها: **سر حرف باز شدن**

**سر خر را کج کردن**: *[تعریض]* پێچ کردنه‌وه؛ پێچه‌وکردن؛ دووی بۆره گرێدان؛ ڕێی خۆ گۆڕین ‹تا رئیس را از دور دیدم سر خر را کج کردم و برگشتم به اداره: هه‌ر له دووره‌وه سه‌رۆکم دی، پێچم کرده‌وه و گه‌ڕامه‌وه بۆ مه‌زرینگه›.

**سر خم کردن**: *[کنایی]* سه‌ر دانه‌واندن؛ سه‌رنه‌وی کردن؛ فه‌رمان بردن؛ سه‌ره‌ره نامنه‌ی؛ به‌ڕێوه بردنی ده‌ستوور و فه‌رمان: **سر فرود آوردن**

**سر خواباندن**: *[مجازی]* ناخلاف لێ گرتن؛ به ناخافڵدا خستن؛ به سه‌را چوون؛ خافڵگیر کردن ‹خیال نکن می‌توانی مرا سر بخوابانی: وا نه‌زانی ده‌توانی ناخلافم لی بگری›.

**سر خود را بالا گرفتن**: *[مجازی]* سه‌ر خۆ هه‌ڵبرین؛ سه‌ر خۆ به‌رزکردنه‌وه؛ شانازی‌کردن ‹آفرین، هم دزدی بکن، هم سرت را بالا بگیر!: ئافه‌رم، دزی بکه و سه‌ریشت هه‌ڵبره!›.

**سر خود را به باد دادن**: *[مجازی]* سه‌ری/ سه‌ر خۆ به بادان؛ بوونه باییس خۆ؛ سه‌ر خۆ خواردن؛ خۆ تێدا بردن ‹به خاطر این کارها سرش را به باد می‌دهد: له به‌ر ئه‌م کارانه، سه‌ری خۆی ده‌دا به بادا›.

**سر خود را به جایی زدن**: سه‌ر/ سه‌ری خۆ له

جێیەک دان/ کوتانە/ مالینە جێگاییێکدا؛ سەر/ سەری خۆ بە جێگاییێکدا مالین.

**سر خود را پایین انداختن:** سەر/ سەری خۆ داخستن: ١. سەر دانەواندن؛ سەری خۆ بە لای سنگدا دانەواندن؛ سەرەو وێ وسەیرە ‹سرم را انداختم پایین و چیزی نگفتم: سەرم داخست و هیچم نەگوت› ٢. *[مجازی]* سەر خۆ کزکردن؛ ئاوڕ لە هیچ لایەک نەدانەوە ‹سرم را انداختم پایین و کارم را کردم: سەرم داخست و کارەکەمم کرد› ٣. *[مجازی]* سەر شۆڕ بوون؛ شەرمەزار بوون؛ شەرمەسار بوون ‹بە خاطر رفتار زشت تو باید سرم را پایین بیندازم: لەبەر کردەوەی دزێوی تۆ، ئەبێ سەرم داخەم›.

**سر خود را جای پای خود گذاشتن:** *[کنایی]* لووت شۆڕکردنەوە؛ سەرشۆڕکردنەوە؛ لووت داژاندن/ داژەندن؛ سەر دەبەر خۆ نان ‹دو روز دیگر سرت را می‌گذاری جای پایت و برمی‌گردی: دوو رۆژی‌تر لووت شور دەکەیەوە و دەگەڕیتەوە›.

**سر خود را دزدیدن:** سەر/ سەری خۆ دزینەوە؛ سەری خۆکێشانە دواوە.

**سر خود را زدن:** *[مجازی]* سەر کۆتاکردنەوە؛ کۆتاکردنەوەی قژ.

**سر خوردن:** *[مجازی]* دڵ تەزین؛ دڵ دامان؛ بە خۆدا شکانەوە ‹از آن دختر سر خورده بود: دلی لەو کچە تەزیبوو›.

**سر دادن:** ١. هەڵدان؛ بەردان؛ وەر دەی/ دای ‹آواز سر داد: بانگی هەلدا› ٢. نانە سەر؛ سەر دان؛ نیای سەر؛ باقی دانەوە؛ لە سەودادا، دانەوەی زیادەی نرخی کالای وەرگیراو ‹ساعت‌هامان را عوض کردیم و من پانصد تومان سر دادم: سەعاتەکانمان گۆڕیەوە و ئەمن پانسەد تمەنم نایە سەری› ٣. *[مجازی]* سەر بۆ شکاندن؛ سەر نانە ڕێ؛ سەر لە پێناو نان؛ بۆ کەسێ یان شتێ گیان بەخت‌کردن.

**سر در آخور خود داشتن:** *[تعریض]* دەست بە کلاوی خۆوە بوون/ گرتن؛ دەست وەر نەدان لە کاری دیتران ‹سرت در آخور خودت باشد و کار به کار کسی نداشته باش!: دەستت بە کلاوی خۆتەوە بێ و کارت بە کاری کەسەوە نەبێ!›.

**سر در آخور کسی کردن:** *[تعریض]* کوێخایی کەسێ کردن؛ خۆ هەڵقوتاندن لە کاری کەسێکدا ‹کار تو همین است که سر در آخور این و آن بکنی؟: کارت هەر ئەمەیە کوێخایی ئەم و ئەو بکەی؟›.

**سر درآوردن:** سەر دەرهێنان/ دەرێنان؛ سەر دەرهاوردن؛ سەرە بەر ئاردەی: ١. *[مجازی]* سەر لێ دەرکردن؛ تێگەیشتن ‹بالاخره از کارش سر در می‌آورم: ئاخری لە کاری سەر دەردینم› ٢. دەرکەوتن؛ سەر هەڵێنان؛ کوت‌وپڕ لە جێگایەکەوە قوت بوونەوە ‹چند ماه بعد از آمریکا سر در آورد: چەند مانگ دواتر، لە ئەمریکاوە سەری دەرهینا›.

**سر دواندن:** *[مجازی]* سەگ بە حەسارکردن؛ دەساو دەس پێ‌کردن؛ دەسی– دەسی پێ کردن؛ هات‌وچووی بێ‌هۆ پێ‌کردن و بەڵێنی ئەمڕۆ و بەیانی پێ دان ‹دو ماه مرا سر دواند و آخر هم خانه را به دیگری فروخت: دوو مانگ سەگ بە حەساری پی‌کردم و لە دواییدا ماڵەکەی بە یەکێکی‌تر فرۆشت›.

**سر راحت به زمین گذاشتن:** *[کنایی]* سەری سووک نیانە سەر سەرین؛ بە بار سووکی خەوتن (یان مردن)؛ سەری بێ‌خەم نیانەوە ‹در طول آن سالها یک شب نشد سر راحت به زمین بگذاریم: لەو هەموو سالانەدا، شەوێک نەبوو سەری سووک بنەینە سەر سەرین›.

**سر راه کسی را گرفتن:** سەرەڕێی بە کەسێ‌گرتن؛ ڕێ پێ گرتن؛ ڕێ لێ گرتن؛ ڕێ بە کەسێ گرتن؛ وەرە ڕاو یۆی گێرتەی؛ بەرگری‌کردن لە ڕۆیشتنی کەسێک ‹شبها سر راه مردم را می‌گرفتند و لختشان می‌کردند: شەوانە

سەرەرییان بە خەڵک دەگرت و ڕووتیان دەکردنەوە›.

**سر رسیدن:** ١. گەیشتنە سەر؛ پەیدا بوون؛ گەیشتنە بەرەوە؛ پێ گەیشتن؛ پەنە یاوای؛ سەرەنە ئامەی؛ ئەنزیەی؛ هاتن یا گەیشتن، بەتایبەت لە کاتی ڕووداوێکدا ‹دزد داشت فرار می‌کرد کە آزاد سر رسید: دزەکە خەریک بوو دەرچێ ئازاد گەیشتە سەری› ٢. *[مجازی]* تەواو بوون؛ هاتنە سەر؛ بە سەر هاتن؛ تەواو بوونی ماوەی شتێک ‹مهلتت سر رسیده: ماوەت تەواو بووە›.

**سر رفتن:** هەڵچوون؛ چوون؛ شیەی؛ شیای؛ سەرڕێژ بوون؛ لێواولێو بوون و ڕژان ‹شیر سر رفت: شیرەکە هەڵچوو›.

**سر زدن:** ١. سەر هەڵدان؛ هەڵهاتن؛ ئەنگوتن؛ ئەنگووتن؛ شلپین؛ زەیقین ‹سر زدن آفتاب: سەر هەڵدانی خۆر› ٢. لێ بوونەوە؛ دەرکەوتن؛ زیەی؛ زیای؛ ئاشکرا بوون ‹از او کارهایی سر می زد کە حیران می‌ماندی: کاری وای لێ دەبووەوە سەرت سووڕ دەما› ٣. سەر دان؛ سەر قوتان؛ سەر لێ دان؛ سەر وەنە دای؛ دیەنی کردن یان پێڕاگەیشتن ‹سری بە خانەی آرام زدم: سەریکم دا لە ماڵی ئارام› ٤. ☜ **سر بە چیزی زدن**

**سر سالم بە گور بردن:** *[مجازی]* سەری ساق نیانەوە؛ بێ ترس و خەم ژیان و بە مەرگی ئاسایی مردن ‹تو با این کارهایت آخر سر سالم بە گور نمی‌بری: ئەتۆ بەم کارانەوە دەیکەی ئاخری سەری ساق نانیتەوە›.

**سر سبک کردن:** *[مجازی]* خۆ ڕەحەت کردن؛ دەس بە ئاو گەیاندن؛ خۆخاڵی کردنەوە.

**سر سپردن:** *[مجازی]* سەر سپاردن؛ هاتنە بەر فەرمان: **سرسپردە**

**سر سنگین بودن** ☜ **سرسنگین**

**سر شدن:** ١. بە سەر چوون؛ ڕابردن؛ کۆتایی هاتن؛ دوایی هاتن ‹مدت سربازی‌اش سر شد و بە خانە برگشت: ماوەی سەربازیەکەی بە سەر چوو، گەڕایەوە بۆ ماڵ› ٢. بە سەردا چوون؛ سەر بوونەوە؛ چوونە سەردا؛ تێگەیشتن؛ حاڵی بوون ‹من این حرفها سرم نمی‌شود: من ئەم قسانەم بە سەردا ناچی›: **سر کسی شدن**

**سر عملی داشتن:** کارێ لە سەردا بوون؛ بە نیازی کارێک بوون ‹سر رفتن داشتم: ڕۆیشتنم لە سەردا بوو›.

**سر فرود آوردن** ☜ **سر خم کردن**

**سر کتاب باز کردن:** *[مجازی]* دەم کتێب کردنەوە؛ لە ڕووی کتێب، فاڵ بۆ کەسێک گرتنەوە.

**سر کردن:** ١. بردنەسەر؛ دانەسەر؛ بە سەر بردن؛ گوزەراندن؛ گوزەران کردن؛ هەڵکردن؛ گوزەرنای ‹سە سال در آنجا سر کردم: سێ ساڵم لەوێ بردە سەر› ٢. *[مجازی]* سەرکێشان؛ مل کێشان؛ سەرەتاتکێ کردن؛ سەر تێ کردن؛ سەر ئەنەکەردەی؛ سەری خۆ بردنە ناو جێ یان شتێکەوە ‹سرت را نکن توی اتاقشان: سەر مەکێشە نێو دیوەکەیان› ٣. بە سەردا دان؛ دانە سەرا؛ کردنە سەر؛ ئەرەدەی؛ دایرە؛ بە مل سەرداکێشان ‹روسریش را سر کرد: سەرپۆشەکەی دا بە سەریا› ٤. *[گفتاری]* کران؛ سازان؛ ساچیان؛ پێکهاتن ‹با هم سر نمی‌کنند: پێکەوە نابانکرێ›.

**سر کسی از خودش نبودن:** *[مجازی]* سەری کەسێ هی خۆی نەبوون؛ سەر پەتی بوون؛ خۆ نەدیتن؛ یەکجار لە خۆ بوردوو بوون ‹مرد نازنینی است، وقتی پای رفاقت بە میان بیاید، سرش از خودش نیست: پیاوێکی پیاوانەیە، کاتێ پای دۆستایەتی بێتە پێشەوە سەریشی هی خوی نیە›.

**سر کسی با تهش بازی کردن:** *[مستهجن]* گای بنە بوون؛ گاگوو بوون؛ گێژ و وێژ بوون؛ هۆش لە خۆ نەبوون.

**سر کسی برای کاری درد کردن:** *[مجازی]* سەری کەسێ بۆ کارێک خوران؛ سەر کەسێ بۆ کارێ ئێشان؛ خولیای کارێ هەبوون ‹تو هم که سرت درد می‌کند برای بحث و جدل: تۆش خۆ سەرت بۆ کێشە دەخورێ›.

**سر کسی بوی قرمه سبزی دادن:** *[مجازی]* سەری کەسێ بۆ گۆنگەلان خوران؛ سەری کەسێ بێ سەودا نەوەستان؛ سەر لێ ئێشان/ خوران؛ قسەی بڤەکردن.

**سر کسی به تنش/ به کلاهش ارزیدن:** *[مجازی]* خاوەن بایەخێک بوون.

**سر کسی به تنش زیادی کردن:** *[مجازی]* گیانی کەسێ بوونە ملی؛ لە گیانی خۆ یاس بوون؛ خۆ خستنە مەترسیەوە ‹انگار سرت به تنت زیادی کرده که با این نرەغول طرف شده‌ای: دەڵێی گیانی بوته ملت وا بەرەنگاری ئەم زلحۆرتە بووی›.

**سر کسی به سر شاه/ شیر ماندن:** *[تعریض]* ماستاو بۆ کەسێ کردن؛ مەرایی کردن بۆ کەسێک؛ با کردنە قولی کەسێک؛ زمانلووسی بۆ کەسێک‌کردن؛ بە کەسێکدا هەڵگوتن.

**سر کسی به سنگ خوردن:** *[مجازی]* لووت کەسێ دانە بەرد؛ ئاوقای چوترم بوون ‹وقتی سرت به سنگ خورد، آن وقت معنی حرفم را می‌فهمی: کە لووتت دای لە بەرد، ئەو کاتە لە قسەم تێدەگەی›.

**سر کسی به کار خودش بودن:** *[مجازی]* سەرقاڵی کاری خۆ بوون؛ بەس بە کاری خۆ پەرژان.

**سر کسی بی کلاه ماندن:** *[کنایی]* کەسێک دەم لە پووش بوون؛ بەش لە ئاسمان و زەوین بریان؛ بەش کەسێ حەپووکریان؛ بێ‌بەش مانی کەسێک؛ دەس کەسێ لە بن هەوانەوە دەرچوون ‹همەی خوارکیها را خوردند و سر ازاد بی کلاه ماند: هەمووی خواردنەکانیان ماشیەوە و ئازاد دەمی لە پووش بوو›.

**سر کسی توی چیزی بودن:** *[کنایی]* سەری کەسێک دە نێو شتێکدا بوون؛ مل دە بەر شتێکەوە نان؛ خەریک بوون بە کارێکەوە ‹همیشه سرش توی کتاب است: هەمیشە سەری دە نێو کتێبدایە›.

**سر کسی توی حساب بودن:** *[مجازی]* سەری کەسێک لە ناو کاردا بوون؛ ئاگەدار/ ئاگادار بوون ‹تو که سرت توی حساب است و وضع ما را می‌دانی: تۆ کە خۆت هاتیتە ناو کاردا و بار و دۆخمان دەزانی›.

**سر کسی توی لاک خودش بودن:** *[مجازی]* سەر کەسێ لە ناو کەوڵ خۆیدا بوون؛ هەر خەریکی کاری خۆ بوون و لا لە کاری کەسی‌تر نەکردنەوە ‹همیشه سرش توی لاک خودش است: هەمیشە سەری لە ناو کەوڵی خویدایە›.

**سر کسی خلوت بودن:** ۱. *[مجازی]* سەری کەسێک سووک/ چۆڵ بوون ‹اگر سرت خلوت شد، این نامه را بخوان: ئەگەر سەرت سووک بوو، ئەم نامەیە وەخوێنە› ۲. *[تعریض]* سەری کەسێک وەرین؛ کەم موو یان بێ‌موو بوونی سەری کەسێک. هەروەها: **سر کسی خلوت شدن**

**سر کسی را بردن:** *[مجازی]* مێشکی کەسێک خواردن؛ سەری کەسێ تەقانن؛ مێشکی کەسێ بردن؛ مەژگوو یۆی واردەی/ بەردەی/ وستەیرە؛ بە هەرا و زلە یان چەنەبازی کەسێک ئازار دان ‹بچەها چه خبرتان است؟ سر همه را بردید: منداڵان ئەوە چتانە؟ مێشکمانتان خوارد›.

**سر کسی را به باد دادن:** *[مجازی]* سەری کەسێک دانە بادا؛ سەر کەسێ دانە با؛ سەرەو یۆی واردەی؛ سەر کەسێ وەبەر گوللە دان؛ بوونە هۆی کوژرانی کەسێک ‹آن قدر در گوشش خواندی و او را وارد معرکه کردی که آخر،

سرش را به باد دادی: ئەونده به گوێتدا دا و هێناتەوە هێلەوە، ئاخری سەرت دا به بادا›.

**سر کسی را به تاق کوبیدن:** *[کنایی]* کەسێک دەم له پووش‌کردن؛ دەستی کەسێک به زاخ/ زاخاودا کردن؛ کڵاو نانە سەر کەسێک؛ کەسێک به فڕ و فێڵ بێ‌بەش‌کردن ‹با خوابیدن توی رختخواب و ناله کردن، سر طلبکار را به تاق کوبید: به له نێو جێ خەوتن و نالاندن، خاوەن قەرزەکەی دەم له پووش‌کرد›.

**سر کسی را تراشیدن:** *[کنایی]* له کەسێ تەڵەکەکردن؛ سەر کەسێک بۆ چاڵ بردن ‹همه را تیغ زده و حالا آمده می‌خواهد سر تو را بتراشد: دەستی هەمووی بڕیوە و ئێسە هاتووە و دەیەوێ تەڵەکەت لێ بکا›.

**سر کسی را خوردن:** *[مجازی]* سەر کەسێک خواردن؛ بوونە هۆی مەرگی کەسێک، بەتایبەت له بەر بێ‌فەڕی ‹سر دو تا زن را خورده، دارد سومی را می‌گیرد: سەری دوو ژنی خواردووە، خەریکە سێهەمیان دێنێ›.

**سر کسی را درد آوردن:** *[مجازی]* سەر کەسێک ئێشاندن؛ سەر کەسێ هاوردنە ئێش؛ به فرەوێژی کەسێک ماندووکردن و ئازاردان ‹باید ببخشید، سر شما را درد آوردم: سەرتانم ئێشاند، دەبێ ببوورن›.

**سر کسی را دور دیدن** ☜ **چشم کسی را دور دیدن**

**سر کسی را زیر آب کردن:** *[کنایی]* سەری کەسێک به گۆمدا کردن؛ سەر کەسێ نیانە چاڵ؛ کەسێک کوشتن ‹سر صاحبخانه را زیر آب کرد و پولها را برد: سەری خاوەن‌ماڵی کردە گۆمدا و پارەکانی برد›.

**سر کسی را شیره مالیدن:** *[کنایی]* مەمکەمژ نانە دەم کەسێک؛ به زمانی خۆش یان به شتێکی کەم کەسێک خاپاندن ‹با این حرفها داری سر مرا شیره می‌مالی؟: بەم قسە و باسانە خەریکی مەمکەمژ بنێیتە دەمم؟›.

**سر کسی را گرم کردن:** *[مجازی]* سەری کەسێک گەرم‌کردن؛ کەسێ خلافاندن: ۱. کەسێ خڵەنجاندن؛ خاواندن؛ به قسەگرتن ‹کمی سر مهمانها را گرم کن تا شام حاضر شود: کەمێ سەر میوانەکان گەرم که تا شێو پێدەگا› ۲. له خشته بردنی کەسێ ؛ کەسێک خاپاندن؛ کەسێک فریودان ‹سر پاسبان را گرم کرد و من توانستم فرار کنم: پاسەوانەکەی خلافاند و من توانیم هەڵێم›.

**سر کسی شلوغ بودن:** *[مجازی]* سەری کەسێک جەنجاڵ بوون؛ سەرقاڵ بوونی کەسێک ‹دیدم سرت شلوغ است، نخواستم وقتت را بگیرم: دیتم سەرت جەنجالە، نەمویست وەختت بگرم›.

**سر کسی گرم بودن:** سەرگەرم بوونی کەسێک؛ سەر قاڵ بوونی کەسێک؛ سەر جەنجاڵ بوونی کەسێک ‹خوب است در مغازه سرش گرم است: باشه له دووکاندا سەری گەرمە›.

هەروەها: **سر کسی گرم شدن**

**سر کسی گیج رفتن:** سەری کەسێک له گێژەوە چوون؛ مامرەگێجێ به کەسێ هاتن؛ سەرەو یۆی گێج واردەی ‹سرم گیج رفت، افتادم: سەرم له گێژەوە چوو، کەوتم›.

**سر کشیدن:** ۱. *[مجازی]* سەردان؛ سەرکێشی کردن؛ سەر کردن‹به همه جا سر می‌کشید: سەری نەدا له هەموو شوێنێک› ۲. سەرکێشان؛ سەرەتاتکێ کردن؛ ملەتاتکێ کردن؛ ملەقوتێ کردن؛ ملەقوتە کردن؛ مل کێشان؛ بۆ دیتن سەر و ملی خۆ بردنە بەرەوە ‹از پنجره سر کشیدم ببینم کیست: له دەلاقەکەوە سەرم کێشا بزانم کێیە› ۳. *[مجازی]* نانە سەرەوە؛ فڕکرن؛ ورماشەنە ٤. هەڵلووشان؛ هەڵلووشین؛ یەکجێ دەم پێوە نان و هەڵقوڕاندن.

**سر کیسه را شل کردن:** *[کنایی]* دەس به باخەڵدا کردن؛ دەس بۆ لای چەپ بردن؛

دەست بە گیرفاندا کردن ‹اگر سر کیسه را شل کنی. کارت درست می‌شود: ئەگەر دەس بکەیتە باخەڵتا کارەکەت ڕێکی دێ›.

**سر کیسه کردن:** *[کنایی]* کڵاو سەر نان؛ بە فێڵ و تەڵەکە لە کەسێک شتێک وەرگرتن: **سر و کیسه کردن**

**سر گاو توی/ در خمره گیر کردن:** *[کنایی]* کەر بە بارەوە لە قوڕ چەقین؛ لەمپەر یان گرفتێکی پێشبینی نەکراو هاتنە ڕێ.

**سر گرفتن:** ۱. *[مجازی]* سەرگرتن؛ پێکهاتن؛ جێبەجێ بوون؛ ڕێک کەوتەی ‹سرانجام عروسی سر گرفت: ئاخری زەماوەن سەری گرت› ۲. لە باقی سەندنەوە؛ سەر وەرگرتن لە مامەڵەدا ‹ساعتم را عوض کردم، سیصد تومان هم سر گرفتم: سەعاتەکەم گۆڕیەوە، سیسەد تمەنیشم باقی سەندەوە› ۳. *[گفتاری]* نانە بان سەرەوە؛ گرتنە سەرەوە؛ لە سەر سەر نان؛ سەروو سەرەی نیەی ‹قرآن سر گرفته بودند: قورعانیان نابووە بان سەرەوە›.

**سر مویی فاصله داشتن:** تاڵە موویەک لە بەیندا بوون؛ مەودایەکی زۆر کەم هەبوون.

**سر مویی فرق نداشتن:** *[مجازی]* عەین‌ومەین بوون؛ عەین و مەغان یەک بوون؛ تەواو وەکوو یەک بوون؛ کوت‌ومت یەک بوون؛ کوت‌ولەت بیەی. هەروەها: **سر مویی فرق نکردن**

**سر نترس داشتن:** ئازا بوون؛ بە جەرگ بوون؛ چاو نەترساو/ چاو نەترس بوون؛ نەترسان ‹خیلی سر نترس داری که این طور می‌نویسی: زۆر ئازای کە ئاوا دەنووسی›.

**سر نخ به دست آوردن:** *[کنایی]* شوێن هەڵگرتن؛ شوێن هەڵگرتن؛ ڕێنج یان نیشانەیەک دۆزینەوە ‹پس از مدتی جستجو، سر نخی بدست آوردند و توانستند دزد را بگیرند: دوای ماوەیەک گەڕان، شوێنیان هەڵکرد و توانیان دزەکە بگرن›.

**سر و دست برای چیزی شکستن:** *[کنایی]* سەر و مل بۆ شتێ شکاندن؛ یەکجار خوازیاری شتێک بوون ‹زمستان، مردم برای نفت سر و دست می‌شکستند: زستان، خەڵکی بۆ نەوت سەر و ملیان دەشکاند›.

**سر و سامان دادن** ☜ **سروسامان**

**سر و صدا را خواباندن** ☜ **سرو صدا**

**سر و صورت دادن** ☜ **سر و صورت**

**سر و صورت را صفا دادن** ☜ **سر و صورت**

**سر و کار داشتن** ☜ **سر و کار**

**سر و کله زدن** ☜ **سر و کله**

**سر و کله‌ی کسی پیدا شدن** ☜ **سر و کله**

**سر و کیسه کردن** ☜ **سر کیسه کردن**

**سر و گوش آب دادن** ☜ **سر و گوش**

**سر و گوش کسی جنبیدن** ☜ **سروگوش**

**سری از هم جدا بودن:** *[مجازی]* گیانێک لە دوو لەشدا بوون؛ ڕۆحێ لە دوو جەستەدا بوون؛ گەلەک ئۆگری یەکتر بوون ‹در آن سالها فقط سری از هم جدا بودیم: لەو سالانەدا گیانێک بووین لە دوو لەشدا›.

**سری توی سرها درآوردن:** *[مجازی]* ناوبانگ دەرکردن؛ سەر هاوردنە ناو سەرگەل؛ ڕێز و بڕێک بە دەست هێنان.

**از سر به در/ بیرون کردن:** *[مجازی]* لە سەر دەرکردن؛ لە سەر لابردن؛ لە بیر خۆ بردنەوە ‹فکر رفتن را از سرت به در کن!: بیری ڕۆیشتن لە سەرت دەرکە!›.

**از سر چیزی گذشتن:** چاوپۆشی کردن لە شتێک؛ لە شتێ چاو نووقاندن؛ لێ گوزەریان ‹این‌بار از سر خطایت می‌گذرم: ئەمجار لە تاوانت چاوپۆشی دەکەم›.

**از سر خود باز کردن:** *[مجازی]* لە مل خۆ کردنەوە؛ لە کۆڵ خۆ کردنەوە؛ لە خۆ دوورکردنەوە ‹این ماشین را از سرم باز می‌کنم: ئەم ماشینە لە مل خۆم دەکەمەوە›.

**از سر راه پیدا کردن:** *[کنایی]* له دەشتا دۆزینەوە؛ له جۆگه هەڵگۆزان؛ ئەوەیۆسەی؛ مفت وەگیر هێنان ‹مگر از سر راه پیدا کردەام که به این قیمت بدهم؟: مەگەر له دەشتا دۆزیومەتەوە بەم نرخه بیدەم؟›.

**از سر کسی افتادن:** *[مجازی]* له سەر کەسێک دەرچوون؛ له بیر چوونەوە و ئیدی لێی نەکۆڵینەوە ‹فکر کاسبی از سرش افتاد: هەوای کسم و کار له سەری دەرچوو›.

**از سر کسی زیاد بودن:** له سەر کەسێک زیاد بوون؛ زۆرتر له نیاز یان بایەخی کەسێک بوون ‹هزار تومان از سرم هم زیاد بود: هەزار تمەن له سەریشم زیاد بوو›.

**از سر گذراندن:** تێپەڕاندن؛ تێپەڕکردن؛ بگاردنی ڕووداو یان سەردەمێکی دژوار و ناڵەبار ‹او خطرهای زیادی را از سر گذرانده است: مەترسیگەیەکی زۆری تێپەڕاندووە›.

**از سر گرفتن:** دەس پێ کردنەوە؛ چوونەوە سەر؛ دیسانەوە درێژە دان ‹از سربازی که برگشت کارش را از سر گرفت: له سەربازی که گەڕایەوە کارەکەی، دەس پێ کردەوە›.

**از سر و کول هم بالا رفتن** ☜ **سر و کول**

**با سر آمدن:** *[مجازی]* بە سەرەوە هاتن؛ بە کەللەوە هاتن؛ بە حەز و لەزەوە هاتن. هەروەها: **با سر رفتن**

**بر سر دوراهی قرار گرفتن:** *[کنایی]* کەوتنە سەر دوو ڕێیانەوە؛ کەوتنە دوو دڵیەوە؛ مانەوە له هەڵێکدا که پێویستی بە هەڵبژاردنی یەکێ له دوو ڕێگه یان دوو بار بێت ‹سارا در مورد انتخاب یکی از دو خواستگارش بر سر دو راهی قرار گرفته بود: سارا له هەڵبژاردنی یەکێ له دوو خوازبێنەکانی کەوتبووە سەر دووڕێیانەوە›.

**بر سر کسی آمدن:** *[مجازی]* بە سەر کەسێدا هاتن/ بارین؛ ئامەی ملەرە؛ کەسێک تووشی شتێ هاتن ‹بلاها بر سرم آمد: زۆر بەلام بە سەردا هات›. هەروەها: **بر سر کسی آوردن؛ به سر کسی آمدن؛ به سر کسی آوردن**

**به سر آمدن:** *[مجازی، ادبی]* کۆتایی پێهاتن؛ دوایی هاتن؛ دمایی ئامەی؛ قەتان؛ هەرادیای؛ بڕانەوە؛ تەواو بوون ‹مهلتش به سر آمد: ماوەکەی کۆتایی پێهات›: **سر آمدن**

**به سر آوردن:** *[مجازی، ادبی]* دانه سەر؛ بردنه سەر؛ کۆتایی پێ‌هێنان ‹عمر خود را در آن شهر به سر آورد: تەمەنی خۆی لەو شارەدا دایه سەر›: **سر آوردن**

**به سر بردن:** *[مجازی، ادبی]* بە سەر بردن؛ سەرکردن؛ قەرقەداندن؛ ژیان بردنه سەر ‹در سختی به سر بردن؛ با کسی به سر بردن: له سەختیدا بە سەر بردن؛ لەگەڵ کەسێ سەرکردن›: **سر بردن**

**به سر کسی زدن:** *[مجازی]* دان له سەر کەسێک: ۱. لێویان؛ پەڕینه سەر؛ شێت بوون ‹چرا این‌طور می‌کنی؟ مگر به سرت زده: بۆچی وا دەکەی؟؛ مەگەر داویه له سەرت› ۲. ئامەی سەرەو یۆیەورە؛ له کتوپڕ بیرێکی سەیر بە خەیاڵدا هاتن ‹به سرش زد که خانه و زندگی‌اش را بفروشد و به اروپا برود: دای له سەری ماڵ و سامانەکەی بفرۆشێ و بچێ بۆ ئورووپا›.

**به سر کسی قسم خوردن:** *[مجازی]* بە سەری کەسێک سوێند خواردن: ۱. بە دروستی و ڕاستی کەسێکدا پەرمیان ‹همه به سر او قسم می‌خورند، تو می‌گویی دزد است؟: هەموو بە سەری سوێند دەخون، تۆ دەڵێی دزە؟› ۲. سوێند بە سەری کەسێک؛ بۆ کەسێک ڕێزنان و بە ژیانی سوێند خواردن ‹به سر شما قسم می‌خورم که نمی‌دانستم: سوێند بە سەری ئێوە نەمدەزانی›.

**تو سر چیزی خوردن:** *[مجازی]* له بەرەوکەوتنی شتێک؛ له بڕشت و بایەخی شتێ کەم بوونەوە ‹این روزها تو سر مدرک تحصیلی خورده و دیگر ارج و قرب گذشته را ندارد: ئەم ڕۆژانه بەڵگەی

خوێندەواری لە بیرمۆ کەوتووە و ئیتر باوی جارانی نەماوە›.

**تو سر چیزی زدن:** *[مجازی]* شتێک تۆپاندن/ مراندن/ مردارەو کردن؛ بێ‌نرخ و بایەخ کردنی شتێک ‹خواست تو سر قیمت بزند: ویستی نرخەکەی بتوپێنێ›.

**تو سر کسی زدن:** دانە سەر کەسێکدا؛ کوتانە سەر کەسێکا؛ کەسێک تەمێ کردن.

**در سر پروراندن:** *[مجازی، ادبی]* لە خەیاڵدا بوون؛ لە بیر و هزردا وەک ئاوات و پلانێک پێوە خەریک بوون ‹سالها فکر فرار را در سر می‌پروراند: لە مێژساڵ بیری دەرچوونی لە خەیاڵدا بوو›.

**در سر داشتن:** لە سەردا بوون؛ بە نیاز بوون؛ لە بیردا بوون ‹از اول در سر داشت که کاری پیدا کند: لە سەرەتاوە لە سەریدا بوو کارێک بدۆزێتەوە›.

**زیر سر داشتن** ☜ **زیر**[3]

**سر**[2]**:** *صفت.* سەر: ۱. هەڤیاز؛ بانتر؛ باشتر؛ چاکتر؛ خاستر؛ قەنجتر ‹سر بودن: سەر بوون› ۲. بە دۆخ یان چۆنیەتیەک ‹سر حال: سەر حاڵ›.

▣ **سر هم:** لە سەریەک؛ سەریەک؛ پێکەوە؛ یۆوە: ۱. لێک پەیوەست؛ سەروو هەنترینی ‹این چهار تکه سر هم بود: ئەم چوار تیکە لە سەریەک بوون› ۲. سەرجەم؛ وێکرا؛ تێکڕا؛ پێوەرە ‹سر هم چقدر خرج کردی؟: لەسەریەک چەندت خەرج کرد؟›.

▣ **سر پا بودن:** ۱. سەر پا بوون؛ بە سەر پاوە بوون ۲. *[کنایی]* بە گوڕ بوون؛ بە تین بوون؛ هەبوونی توانایی و هێزی پێویست بۆ درێژەی ژیان یان کار و چالاکی ‹عمو جان در هشتاد سالگی هنوز سرپاست: ئامامۆ لە هەشتا ساڵیدا هێشتا بە گوڕە›.

**سر پا نگهداشتن:** وەرقلاندن؛ ڕاگرتن بە پاوە.

**سر حال آمدن:** *[مجازی]* هاتنەوە سەر خۆ؛ هاتنە سەر خۆ؛ سەر هەڵێنانەوە؛ ژووژانەوە؛ ژیانەوە؛ چاک بوونەوە ‹چند روز در بیمارستان خوابید تا سر حال آمد: چەند ڕۆژ لە نەخۆشخانەدا خەوت تا هاتەوە سەر خۆ›.

**سر حال آوردن:** *[مجازی]* ژووژاندنەوە؛ بووژاندنەوە؛ هێنانەوە گوڕ ‹هوای خنک او را سر حال آورد: هەوای فێنک ژووژاندیەوە›.

**سر حال بودن:** *[مجازی]* بە گوڕ بوون؛ کۆک بوون؛ ساز و دڵخۆش بوون؛ ساق و سەلیم بوون؛ گوربزە بوون؛ نۆنگە بوون.

**سر کیف بودن:** *[مجازی]* بە کەیف بوون؛ بە دەماخ بوون؛ هەبوونی هەستی شادی و خۆشی ‹دیشب خیلی سر کیف بودی: دوێشەو زۆر بە کەیف بووی›.

**از کسی سر بودن:** لە کەسێک سەرتر بوون؛ لە کەسێک هەڤیاز بوون ‹آزاد در ادبیات از همه سر است: ئازاد لە وێژەوانیدا لە هەمووان سەرترە›.

**سر**[3]**:** *حرف.* ۱. سەر؛ سەرەتا؛ لە سەر ‹سر شب: سەرەتای شەو› ۲. سەر؛ بان؛ لە سەر ‹سر راه؛ سر کوه: سەر ڕێگا؛ بان یاڵ› ۳. نێو؛ ناو؛ سەر ‹حمام سر خانە: حەمامی نێو ماڵ› ٤. کاتی؛ لە کاتی؛ لە سەر؛ سەر؛ لای؛ هند ‹سر شام: کاتی شێو› ٥. لە سەر؛ سەر؛ پای؛ لە بارەی ‹دعوا سر پول است: شەڕ لە سەر پارەیە› ٦. لە ڕووی؛ لە سەر؛ لەبەر؛ سەروو ‹سر سیری: لە ڕووی تێریەوە› ۷. سەر؛ بان؛ لا؛ لە لا؛ چەق ‹سر سفره؛ سر میز: سەری سفرە؛ بان مێز›.

▣ **سر بزنگاه:** لە کاتی خۆی؛ سەروەخت؛ باشترین کات بۆ ئامادە بوون لە جێگایەک ‹آزاد سر بزنگاه رسید: ئازاد لە کاتی خۆیدا گەیشت›.

**سر تا ته:** سەر و بن: ۱. هەوەڵ تا ئاخر ‹سر تا ته کتاب را خواند: سەر و بنی کتێبەکەی خوێندەوە› ۲. هەر؛ تەنیا ‹سر تا تهش همین بود: سەر و بنی هەر ئەمە بوو›.

**سر راه:** سەرە ڕێ؛ سەرە ڕا؛ لە سەر ڕێگە؛ بان

ڕا؛ سەری ڕێگە؛ لە ڕێگا؛ سەر ڕێ؛ ڕانە؛ وەرەڕا؛ بە ڕێوە؛ بە ڕێدا؛ لە شوێنی ئاموشۆدا ‹سر راه دو تا نان بخر: سەرە ری دوو نان بکڕە›.

**سر سیری:** *[کنایی]* نە بەدڵی؛ بە بێ‌مەیلی ‹او مدتی است سر سیری کار می‌کند: ماوەیەکە نە بەدڵی کار دەکا›.

**سر سیاه زمستان:** *[مجازی]* سۆڵەی زۆسان؛ سەختی زستان؛ شەختەی زستان؛ لە سەرما و سۆڵەی زستاندا ‹سر سیاه زمستان ما را از خانه‌اش بیرون کرد: سۆڵەی زوسان لە ماڵەکەی دەری‌کردین›.

**سر صبر:** لە سەر خۆ؛ بە هێمنی؛ بە کاوەخۆ؛ بە پشوو؛ نە بلەز؛ بە شێنەیی و هێدیکایی ‹سر صبر بنشین و درست مطالعه کن: لە سەر خۆ دانیشە و جوان وەخوێنە›.

**سر ضرب:** بەلەز؛ زووبەزوو؛ دەسبەجێ؛ ئازا؛ دەمودەس؛ خێرا؛ تاقڵ؛ زوو؛ کرژ و کۆڵ؛ گورج و گۆڵ.

**سر فرصت:** ۱. لە کاتی خۆی؛ وەختی خۆی؛ لە وەختی شیاودا ۲. لە دەرفەتێکدا؛ لە کاتێکدا کە کارێکی‌تر هەبێ ‹سر فرصت این کتاب را بخوان: لە دەرفەتێکدا ئەم کتێبە بخوێنە›.

**سر وقت:** سەروەخت؛ لەسەر وەخت؛ لە کاتی دیاریکراو یان شیاودا.

**از سر:** لە سەر ڕا؛ لە سەرەوە؛ لە سەرۆ؛ سەرەوە؛ هەمدیس؛ هەمیسان؛ دیسان؛ دیسانەوە؛ ژنۆ؛ دووبارە؛ لە سەرەتاوە؛ لە هەوەڵەوە.

⊡ **سر پا ایستادن:** *[گفتاری]* بە پێوە ڕاوەستان؛ وە پاوە وێسیان؛ پەیوە/ پاوە مدرەی؛ وەستان بە سەر پێوە.

**سر پا گرفتن:** *[گفتاری]* ڕاهێڵان؛ داهێشتن؛ ڕاداشتن؛ ڕاهێشتن؛ ئەرە دارتەی؛ دارایرە؛ یارمەتی دانی منداڵ بۆ دەس‌بەئاو کردن ‹بچە را سر پا بگیر تا خودش را خیس نکند: منداڵەکە رابیلە با خۆی تەڕ نەکا›.

**سر تاس نشاندن:** *[مجازی]* ڤەکۆڵی کردن؛ قسە لێ کێشانەوە؛ بە هەڕەشە و لێدان، قسە لێ دەرهێنان.

**سر جا آمدن:** هاتنەوە سەر خۆ؛ هاتنە سەر جێ؛ هاتنەوە جێ؛ ئامایوە یاگێ؛ گەڕانەوە سەر باری ئاسایی ‹کمی نشستیم تا حالم سر جا امد؛ حواسش سر جا امد: تۆزێ دانیشتین تا هاتمەوە سەر خوم؛ هۆشی هاتەوە سەر خوی›.
هەروەها: **سر جا آوردن**

**سر جای خود رفتن:** چوونە جێی خۆی؛ لوایوە یاگۆ وێ؛ لە جێگای خۆدا جێ‌گرتن ‹پیچ را فشار دادم، رفت سر جایش: پاڵم بە پێچەکەوە نا، چووە جێی خوی›. هەروەها: **سر جای خود انداختن**

**سر جای خود نشاندن:** *[کنایی]* نانەوە سەر جێی خۆی؛ ئەرە یاگۆ وێ نیشنەی؛ داتەمراندن؛ داسەکناندن؛ نیشنایرە؛ بەر بە فرەچوونی کەسێک گرتن ‹خیلی هارت‌وپورت می‌کرد، مجبور شدم او را سر جایش بنشانم: هاشەوهووشەی زۆری دەکرد، ناچار بووم بیمەوە سەر جێی خوی›.

**سر جایش بودن:** ۱. لە جێی/ جێگای خۆدا بوون؛ لە سەر جێی خۆ بوون؛ یاگۆ وێنە بیەی ‹کتاب سر جایش بود: کتێبەکە لە جێی خویدا بوو› ۲. *[مجازی]* لە سەر خۆ بوون؛ لە دۆخی ئاساییدا بوون ‹حالش سر جایش نیست: حاڵی لە سەر خوی نیە› ۳. *[کنایی]* هەر بەردەوام بوون؛ لە جێی خۆدا مان ‹قولی کە دادی سر جایش هست؟: ئەو بەڵێنە دابووت هەر بەردەوامە؟›.

**سر جای کسی نشستن:** ۱. لە جێی/ جێگای کەسێک دانیشتن؛ دانیشتن لە سەر جێگەیەک کە ئی کەسێکی دیکەیە ۲. لە جێی/ جێگای کەسێک دانیشتن؛ نیشتنەجێگەی کەسێک؛ جێ کەسێک

گرتنەوە؛ پلە و پایەی کەسێک وە دەست هێنان ‹بعد از رضا شاه پسرش سر جایش نشست: دوای ڕەزا شا کوڕەکەی لە جێی دانیشت› ۳. *[کنایی]* جێی کەسێک گرتنەوە؛ یاگۆ یۆی گێرتەیوە؛ درێژە پێدانی کار یان کردەوەی کەسێک ‹مدتی از دست بچەها خواب نداشتیم، حالا نوەها سر جایشان نشستەاند: ماوەیەک بە بۆنەی منداڵەکانەوە خەومان نەبوو، ئێستا نەوەکان جێیان گرتوونەتەوە›.

**سر چیزی آمدن:** ۱. هاتنەوە سەر شتێک ‹امدیم سر بحث قبلی: هاتینەوە سەر باسی پێشوو› ۲. هاتنە سەر شتێک؛ نزیک شتێک کەوتنەوە؛ هاتنە لای شتێک ‹آمدیم سر میز: هاتینە سەر میزەکە› ۳. *[مجازی]* هاتنە/ هاتنەوە سەر شتێک؛ دەرکەوتنی شتێک ‹سر شوق آمدن: هاتنە سەر کەیف›.

**سر چیزی انداختن:** خستنە سەر شتێک؛ بە دەم شتێکەوە دان ‹پستو را هم انداختیم سر مغازە، کمی بزرگتر شد: پێشخانەکەشمان خستە سەر دووکانەکە، تۆزێ گەورە بۆوە›.

**سر چیزی بازی درآوردن:** لە سەر شتێک بڕوبیانوو هێنانەوە ‹سر فروش خانە بازی دراورد: لە سەر فرۆشتنی ماڵەکە بڕ و بیانووی هێنایەوە›.

**سر چیزی رفتن:** ۱. چوونە سەر شتێک؛ چوونە سۆراخی شتێکەوە ‹رفت سر قابلمە و یک تکە گوشت برداشت: چووە سەر قابلمەکە و پلە گۆشتێکی هەڵگرت› ۲. چوونە سەر شتێک؛ بە شتێکەوە پەرژان ‹برویم سر بحث اصلی: بچینە سەر باسی سەرەکی› ۳. لە سەر شتێک چوون؛ بە بۆنەی شتێکیەوە لە بەین چوون ‹ماشین هم سر قمار رفت: ماشینەکەش لە سەر قومار چوو›.

**سر چیزی کار کردن:** لە سەر شتێک کار کردن: ۱. خەریکی شتێک بوون؛ سەرقاڵی شتێک بوون ‹سر مقالەی دیروزی کار می‌کنم: لە سەر وتارەکەی دوێنێکە کار دەکەم› ۲. بە شتێک کارکردن ‹سر ماشین کار می‌کنم: لە سەر ماشێن کار دەکەم›.

**سر چیزی گذاشتن:** لە سەر شتێک دانان: ۱. لە بان چتێکەوە دانیان؛ نیانە بان شتێک؛ ئەرە سەروو چێوێوی نیەی؛ نانە سەر شتێک ‹ساعت را گذاشت سر طاقچە: سەعاتەکەی لە سەر ڕەفەکە دانا› ۲. *[مجازی]* لە ڕێی شتێک دانان؛ بۆ گەیشتن بە شتێک، لە دەست دان ‹جانش را سر این مرز و بوم گذاشت: گیانی لە سەر ئەم وڵاتە دانا›.

**سر چیزی نشستن:** لە سەر شتێک دانیشتن؛ سەروو چێوێویەوە نیشتەیرە: ۱. لە لێوار یان لای شتێکەوە دانیشتن ‹نشست سر حوض: لە سەر حەوزەکە دانیشت› ۲. *[مجازی]* لە سەر شتێک دانیشتنەوە؛ بە کارێکەوە پەرژان ‹نشستم سر کارم: دانیشتمەوە سەر کارەکەم›.

**سر حرف خود ایستادن/ بودن:** *[گفتاری]* لە سەر قسەی خۆ ڕاوەستان/ وەستان/ بوون؛ پابەندی قسە و بەڵێنی خۆ بوون ‹اگر تو دبە نکنی من سر حرف خود ایستادەام: ئەگەر تۆ دەبە نەکەی، من لە سەر قسەی خۆم وەستاوم›.

**سر حرف را باز کردن:** *[مجازی]* سەر قسە داهاوردن؛ سەری باس/ قسە داهێنان؛ سەر قسە دەرخستن؛ دەست پێکردنی وتووێژ.

**سر خاک کسی رفتن:** چوونە سەر خاکی کەسێک؛ ڕۆیشتن بۆ سەر قەبری کەسێک؛ چوونە سەر زیارەتی کەسێ.

**سر خشت افتادن:** *[کنایی]* کەوتنە ناو تەشت؛ لە دایک بوون؛ هاتنە دنیاوە.

**سر خشت رفتن:** *[کنایی]* چوونە سەر تەشت؛ زایین؛ منداڵ هاوردن.

**سر خشت نشاندن:** *[کنایی]* نانە سەر تەشت؛ زایاندن؛ یارمەتی دان بە دایک لە کاتی منداڵ بوونیدا.

**سر خود کشیدن:** نخافتن؛ کێشانە مل سەردا؛

خۆ داپۆشین به سەرەنداز.

**سر دست بردن** ☜ روی دست بردن، **رو**[2]

**سر دست بلند کردن:** به سەر دەستەوە گرتن؛ گرتنە سەر دەستەوە؛ بەرزکردنەوە و لە سەر دەست و سەر نان ‹قهرمان را سر دست بلند کردند: قارەمانەکەیان بە سەر دەستەوە گرت›.

**سر دست رفتن:** سەرسم دان؛ سەرسم بردن؛ سەرانگریٚ بوون؛ تەرپلین؛ ساتمە بردن؛ هەڵەنگوتن؛ ڕەت بردنی چارەویٚ.

**سر ذوق آمدن:** *[مجازی]* سۆز هەستان؛ هاتنە سۆز؛ چیٚژە و دۆخیٚکی تایبەت بۆ چالاکیەک پەیدا کردن.

**سر راه گذشتن:** لە سەر ڕیٚ دانان؛ نانە سەر ڕیٚ؛ لە سەرە ڕیٚ/ سەرە ڕیٚگا دانان ؛ نیایرە سەروو ڕای؛ ویٚڵ کردن لە سەر بوارگەدا ‹بچه را گذاشته بودند سر راه: منداڵەکەیان لە سەر ڕیٚ دانا بوو›.

**سر زا رفتن:** بە سەر زگەوە چوون؛ لە سەر سکەوە چوون؛ سەروو لەمیٚنە لوەی؛ مردن (منداڵ یان دایک) لە کاتی زک و زادا ‹زن اولش سر زا رفت؛ بچەی دومش سر زا رفت: ژنی هەوەڵی بە سەر زگەوە چوو؛ منداڵی دووهەمی لە سەر سکەوە چوو›.

**سر زبانها افتادن:** کەوتنە سەر زاران: ۱. ناو دەرکردن؛ ناو داخستن؛ بەناوبانگ بوون ‹این شعر سر زبانها افتاده بود: ئەم شیعرە کەوتبووە سەر زاران› ۲. بلاوەوە بوون؛ باو سەندن؛ کەوتنە دەم ‹یک روز سر زبانها افتاد که قرار است صلح بشود: ڕۆژیٚک کەوتە سەر زارانەوە کە بڕیارە ئاشتی بکریٚ› * **به سر زبانها افتادن**

**سر سبیل شاه نقاره زدن:** *[مجازی]* قەف سمیٚڵ بادان؛ خاوەن هیٚمنی، ئاسایش و ماڵ و سامانی زۆر بوون.

**سر شوق آمدن:** *[مجازی]* نەشەگرتن؛ هۆگرەتی پەیدا کردن؛ هاتنە سەر شەوق.

**سر غیرت آمدن:** *[مجازی]* خیرەت جمین/ جمەی؛ خیرەت گوڵ کردن.

**سر قدم رفتن:** *[مجازی، گفتاری]* چوونە دەساو ؛ دەس بە ئاو گەیاندن ‹شبی پنج بار سر قدم میرود: شەویٚ پیٚنج جار دەچیٚتە دەساو›.

**سر قوز افتادن:** *[مجازی، گفتاری]* ڕِک کردن؛ وڕک کردن؛ گەی کردن؛ سینگ کردن؛ سەر قین کەوتن؛ هاتنە سەر ناکۆکی و دژبەرایەتی ‹سر قوز افتاده بود و از رادیو دست برنمیداشت: ڕکی کردبوو دەستی لە ڕادیۆکە هەڵنەدەگرت›.

**سر قول خود بودن:** لە سەر بەڵیٚنی خۆ بوون/ مان؛ پابەندی گفت و بەڵیٚنی خۆ بوون ‹هنوز سر قولت هستی؟: هیٚشتا لە سەر بەڵیٚنت ماوی؟›.

**سر کار آمدن:** هاتنە سەر کار: ۱. بۆ شویٚنی کار هاتن ‹حالا وقت سر کار آمدن است؟: ئیٚستە کاتی هاتنە سەر کارە؟› ۲. بە سەرۆکایەتی و حکوومەت گەیشتن ‹بعد از کودتا، زاهدی سر کار آمد: پاش کوودەتا، زاهیدی هاتە سەر کار›.

**سر کار رفتن:** چوونە سەر کار: ۱. سەرقاڵی کار بوون؛ بە کار پەرژان؛ خەریکی کار بوون ‹تازه سر کار رفته است: تازە چوەتە سەر کار› ۲. چوون بۆ سەر کار؛ بۆ شویٚنی کارکردن چوون.

**سر کار گذاشتن:** ۱. نانە سەر کار؛ دامەزراندن ‹او را برد کارخانه و گذاشت سر کار: بردیە کارخانە و نایە سەر کار› ۲. *[کنایی]* گاڵتە/ تیتاڵی پیٚ کردن؛ سەرقاڵ کردن و خلافاندنی کەسیٚک بۆ بوونە گاڵتەجاڕ ‹میخواست تورا سر کار بگذارد و کمی بخندد: بەنیاز بوو گاڵتەت پی بکا و هیٚندیٚک پیٚبکەنیٚ›.

**سر کردن:** کردنە سەر؛ دانە سەرا؛ ئەرەدەی؛ دایرە؛ سەر داپۆشان ‹کلاه سر کرد: کڵاوی کردە سەری›.

**سر کسی آمدن:** *[مجازی، گفتاری]* ۱. بە سەر کەسیٚکدا هاتن؛ هاتنە سەر کەسیٚکا؛ ملوو

پۆیەرە ئامەی؛ وەبەر کارەسات یان ڕووداوێک کەوتن ‹تا سرم نیامده بود باور نمی‌کردم: تا بە سەرمدا نەهاتبوو بڕوام نەدەکرد› ۲. هاتنە سەر کەسێک ‹آمده سر من، می‌گوید پول بده: هاتوتە سەرم، دەڵێ پارەم بدەیە›.

سر کسی آوردن: *[مجازی، گفتاری]* بە سەر کەسێکدا هێنان؛ هاوردنە سەر کەسێکا؛ کەسێک تووشیار کردن: **به سر کسی آوردن**

سر کسی افتادن: *[مجازی، گفتاری]* کەوتنە سەر کەسێک؛ کەفتنە مل کەسێ؛ بوون بە ڕیشی کەسێکەوە؛ بە سەر کەسێکدا سەپان ‹خرج او هم افتاد سر من: خەرجی ئەویش کەوتە سەر من›.

سر کسی بازی درآوردن: *[مجازی]* پەت پەتێن بە سەری کەسێکدا هێنان؛ بە ئاکاری گزیکارانە و درۆزنانە کەسێک ئازار دان ‹نمی‌دانی در این دو سال چه بازی سر ما درآوردند: نازانی لەم دوو ساڵەدا چ سەرسەبەنێکیان بەسەر ماندا هێنا›.

سر کسی حامله/ آبستن بودن: بە کەسێکەوە ئاوس بوون؛ کەسێک لە زگدا بوون؛ سنگ بە کەسێکەوە پڕ بوون ‹تازه سر بچه‌ی دومش حامله بود: تازە بە منداڵە دووهەمەکەیەوە ئاوس بوو›.

سر کسی خراب شدن: *[مجازی]* تەپ دانە سەر کەسێ؛ بوونە سەرباری کەسێک؛ بێ بانگێشتن بوونە میوانی کەسێک: **روی سر کسی خراب شدن**

سر کسی درآوردن: *[مجازی]* بە سەر/ ملی کەسێکدا ڕژاندن؛ بە کەسێکدا ڕژاندن؛ ڕێتەی ملوو پۆیەرە ؛ لە سەر کەسێ تۆڵەکردنەوە ‹چرا دق دلی‌ات را سر من درآوردی؟: بۆچی داخی خۆت بە سەری مندا ڕژاند›.

سر کسی شدن ☜ **سر شدن –۲**

سر کسی کشیدن: *[گفتاری]* بە سەر کەسێکدادان؛ کێشانە سەر کەسێکا؛ دانە مل کەسێدا ‹لحاف را کشید سرش: لێفەکەی دایە سەریدا›.

**سر کسی کلاه رفتن:** *[مجازی]* کڵاو چوونە سەر کەسێک: ۱. فریو خواردنی کەسێک ‹در این معامله کلی سر تو کلاه رفت: لەم مامەڵەدا کۆڵێ کڵاو چووە سەرت› ۲. زەرەر لێکەوتن؛ زەرەر کردن ‹سرت کلاه رفت، این ماشین را نخریدی: کڵاو چووە سەرت، ئەم ماشینەت نەکڕی›.

**سر کسی کلاه گذاشتن:** *[مجازی]* کڵاو نانە سەر کەسێک؛ کەسێک فریو دان؛ یۆ گۆڵ دەی ‹فروشنده سرش کلاه گذاشت و رادیو دست دوم را به جای نو به او فروخت: فرۆشیارەکە کڵاوی نایە سەری و ڕادیۆی دەستە دووی بە جێگای تازە پێ‌فرۆشت›.

**سر کسی هوو آوردن** ☜ هوو آوردن سر کسی، **هوو**

**سر گنج نشستن:** *[تعریض]* لە سەر خەزێنە دانیشتن؛ خاوەن پارەی فراوان و بێ‌ئەژمار بوون ‹مگر سر گنج نشسته‌ام که از این پولها خرج کنم؟: مەگەر لە سەر خەزێنە دانیشتووم کە پووڵی وا خەرج کەم؟›.

**سر لج افتادن:** لەنج کردن؛ ڕک کردن.

**سر وقت کسی/ چیزی رفتن:** چوونە سەر کەسێ/ شتێک؛ بۆ لای کەسێ/ شتێک چوون ‹رفته بود سر وقت موزها: چووبوە سەر مۆزەکان›.

**سر وعده حاضر شدن:** لە سەر بڕیار ئامادە بوون؛ لە کاتی بڕیاردراودا لە جێژوان بوون.

**به سر زبانها افتادن** ☜ **سر زبانها افتادن**

**به سر کسی آوردن** ☜ **سر کسی آوردن**

سر –[4]: *پیشواژە.* ۱. سەر– ؛ سەرەک؛ سەرۆک ‹سرپاسبان؛ سرپرست: سەرپاسەوان؛ سەرپەرشت› ۲. سەر– ؛ سەرە– ؛ بەشی سەرووی هەر شتێک ‹سربخاری: سەرەسۆپا› ۳. سەرەو– ؛ سەرە– ؛ دەس– ؛ دەست– ؛ بەرەو– ؛ ڕووە– ؛ سۆ؛ لا؛ لایەن ‹سربالا؛ سرپایین: سەرەوژوور؛ سەرەوخوار›.

**ـ سر** [5]: *پیواژه.* ـ سەر؛ ـ دەس؛ ـ دەست؛ سۆ؛ لا ‹بالاسر: بانسەر›.

**ـ سر** [6]: *پسوند.* ـ سەر؛ جێگا؛ شوێن (لە ناوی شارۆچکە و گوندان) ‹روانسر: ڕوانسەر›.

**سر** [1] / ser/: [انگلیسی]/*اسم.* سێر: ١. سەرناوێکی ماقوولانە بۆ پیاوانی ئینگلیزی، خوارتر لە لورد ٢. سەرناوێک بۆ پیاوانی ئینگلیزی زمان، بە واتای: ئاغا، قوربان.

**سر** [2]: *صفت. [گفتاری]* سڕ؛ کەرخ؛ بێهەست ‹دستهایم از سرما سر شده بود: دەستم لە سەرما سڕ ببوو›.

**سر** / ser(r) ، ـها؛ اسرار/: [عربی]/*اسم.* ڕاز؛ نەهێن؛ نەهێنی؛ مەلامەت ‹سر این کار چیست؟: رازی ئەم کارە چیە؟›.

**سر** / sor/: *صفت. [گفتاری]* خز؛ کاش؛ تەحس؛ خلیسک؛ شەمت؛ شەمیت؛ شەمیتۆک؛ تووز؛ خەزگ؛ سوڕ؛ بە ڕووپەڕێکی لووس و خزەوە.

▣ **سر بودن:** خز بوون ‹زمین خیلی سر است، مواظب باش!: زەوی زۆر خزە، وریا بە!›.

**سر خوردن:** خزان؛ خزیان؛ خلیسکان؛ خلیسکیان؛ خلیسکین؛ هەڵخلیسکین؛ خزیەی؛ خزیای؛ شەمتین؛ حولیسین؛ حولسین؛ تەحسین؛ سوڕ خواردن ‹پایم سر خورد و افتادم: پام خزا و کەوتم›.

**سر دادن:** خزاندن؛ خلیسکاندن؛ هەڵخلیسکاندن.

**سرآستین** / sarāstîn ، ـها/: *اسم.* سەرقۆڵ؛ سەر ئاسین؛ مەچەک پۆش لە کراس و کەوادا.

**سرآسیاب** / sarās(i)yāb/: *اسم.* شوێنەئاش؛ جێی دامەزرانی ئاش.

**سرآشپز** / sarāšpaz ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سەرئاشپەز؛ کەسێ کە سەرپەرشتی چەن شێوکەری لە نێو دامەزراوەیەکدا بە ئەستۆە.

**سرآغاز** / sarāqāz ، ـها/: *اسم.* سەرەتا؛ دەسپێک؛ کەبار؛ بەژرەنگ؛ گەرد و گۆڵ ‹سرآغاز کار؛ سرآغاز گفتگو: سەرەتای کار؛ دەسپێکی وتوویژ›.

**سرا** [1] / sarā ، ـها/: *اسم.* ١. یانە؛ خانوو؛ ماڵ؛ خانگ؛ خانک؛ خێنی؛ جێگای بوونی شتێ ‹سرای سالمندان: یانەی دانسالان› ٢. تیمچە؛ قەیسەری؛ بازارۆکە؛ حەوشەیەک و چەند دالانی سەر داپۆشراو، سەرانسەر دووکان و حوجرەی بازرگانان کە شوێنی سەودایە ٣. *[قدیمی]* سەرا؛ تەلار؛ کاخ؛ کۆشک ٤. *[ادبی]* جیهان؛ دنیا.

▣ **سرای آخرت:** ئەو لا؛ ماڵی ئەولا؛ دنیای پاش مەرگ؛ ئەو دنیا؛ ماڵی قیامەت.

**سرای سالمندان:** یانەی دانسالان؛ ئاسایشگای بە ساڵا چوان؛ ماڵی پیران.

**سرای کودک:** باخچەی منداڵان؛ یانەی منداڵان.

**ـ سرا** [2]: *پیواژه.* ـ سەرا؛ جێگا؛ جێگە؛ جێی شتێ ‹کاروانسرا: کاروانسەرا›.

**ـ سرا** / sarā, sorā/: *پیواژه.* ـ هۆن؛ ـ ڤان؛ ـ بێژ؛ ـ وێژ؛ ـ واچ؛ ـچڕ ‹ترانەسرا: لاوکهۆن›.

**ـ سرانی** / sarā'î, sorā'î/ ☜ **ـ سرایی**

**ـ سرائی** / sarā'î/ ☜ **ـ سرایی**

**سرائیدن** / sarā'îdan, sorā'îdan/ ☜ **سراییدن**

**سراب** / sarāb/: *اسم.* ١. [عربی] تراویلکە؛ هاڵ؛ لەیلان؛ ڕەوڕەو؛ پەپەرک؛ ئاونما؛ بەردەتراویلکە؛ بەردەڕێژگە؛ ڕەوڕەوک؛ دیاردەیەکی کەشی بە هۆی تیشکدانەوەی نوور لەسەر توێژێکی هەوای گەرمدا، کە دیمەنێکی وەک ئاو بەدی دێنێ ٢. /ـها/ سەراو؛ سراو؛ بنەبەنگە؛ بناوان؛ سەرچاوکە؛ سەرچاوگە؛ سەرچەمە؛ سەرچاوانە؛ کونجی کارێز؛ شوێنی هاتنەدەری ئاوی چاوکە یان کارێز ٣. سەرچەم؛ سەرچەمە؛ بەشی سەرووی چەم.

**سراپا** / sarāpā/: *قید.* سەرتاپا؛ سەرتاپێ؛ سەراپا؛ سەراپێ: ١. سەر لە بەر؛ هەموو لەش؛ لە سەر تا پێ؛ هەموو ئەندام ‹سراپایش زخمی بود و از آنها خون می‌چکید: سەرتاپای بریندار بوو، خوێنی

لێ‌دەتکا〉 ۲. *[مجازی]* سەراسەر؛ سەرانسەر؛ موو بە موو؛ گش؛ گرد؛ گشت لە گشت؛ بە تەواوی 〈سراپا گوش بودند: سەرتاپێ گوێی بوون〉.

■ **سرا پا گوش بودن**: *[مجازی]* باش گوێ گرتن؛ جوان-جوان گوێدان؛ بە وشیاری و سەرنجی زۆرەوە گوێ شل کردن.

**سراپرده** / sarāparde ، ـهـا: /اسم. [قدیمی] سەراپەردە: ۱. شاهۆبە؛ بارەگا؛ مالێک کە بە چادر، پەردە، فەرش و شتی وا بۆ دانیشتنی دەمەوەختی شا (یان دەسەلاتدارانی‌تر) دروست دەکرا ۲. ژوور؛ ئەندەروون؛ هۆدەی تایبەتی ژنانی پاشا ❊ **پردەسرا**

**سراج** / sarrāc ، ـها؛ ـان/: [عربی] /اسم. چەرمدروو؛ چەرمدوور؛ کەسێ کە کەرەستەی چەرمی ساز دەکا.

**سراجی** / sarrācî/: [عربی] /اسم. ۱. پیشەی چەرمدوور ۲. /ـها/ دوکان یان جێکاری چەرمدروو.

**سراچه** / sarāče ، ـها:/ اسم. سەرا؛ چاوە؛ سویت؛ هۆدە یان ژووری گچکە.

**سرازیر** / sarāzîr/: صفت. سەرەژێر؛ سەرەوژێر؛ سەربەرەژێر؛ سەربەرەو ژێر؛ سەرەوخوار؛ سەربەرەوخوار؛ سەرۆخوار؛ سەربەرەخوار؛ سەرەو وار؛ بەرەوخوار؛ سەرەوار؛ سەر بە ژێر؛ بەر بژێر؛ بەرەو ژێر؛ بەرقە ژێر؛ ڕوو بە خوار؛ لێژ؛ نشێو؛ بەرەژێر؛ سەرەچێر؛ سەرەوچێر؛ سەرەولێژ؛ خێم؛ سەرنشیفی. بەرانبەر: **سربالا** 〈خیابان سرازیر: شەقامی سەرەژێر〉.

■ **سرازیر شدن**: سەرەو خوار بوونەوە؛ شەختین؛ بەرەو ژێر بوونەوە؛ سەرەوژێر بوونەوە؛ سەرەوارەوە بیەی: ۱. ڕووەو خوار بزوان؛ سەرەوخوار بوونەوە؛ لوور بوونەوە 〈همە سرازیر شدند بە سوی میدان: هەموو بەرەو مەیدان سەرەو خوار بوونەوە〉 ۲. *[مجازی]* لێژەوە بوون؛ خوڕ بوونەوە 〈کاسە و افتاد و آب سرازیر شد روی فرش: کاسەکە داکەوت و ئاو لێژەوە بوو بە سەر فەرشەکەدا〉. هەروەها: **سرازیر کردن**

**سرازیری** / sarāzîrî ، ـها:/ اسم. سەرەوخواری؛ لێژایی؛ لێژی؛ سەرەولێژایی؛ بەرەو لێژایی؛ سەرەولێژی؛ سەرەوخوارکێ؛ سەرەوخوارە؛ سەرەوخوارەکی؛ سەر بەرە خوارە؛ بەرەوخوارکێ؛ بەرەوخوارکە؛ بەرەوژێری؛ بەربژێری؛ بەرەوژێرکە؛ بەرەوژێرە؛ سەر بەرەو ژێرە؛ سەر بە ژێرە؛ سەرەژێری؛ سەرەوژێری؛ سەرەوارە؛ سەرە و وارە؛ سەرەوارکێ؛ سەرە چێری؛ سەرەوچێری؛ ڕووەو نشێوی. بەرانبەر: **سربالایی** 〈سرازیری کوە؛ سرازیری جادە: سەرەوخواری کێو؛ لێژی ڕێگا〉.

**سراسر** / sarāsar/: قید. سەرانسەر؛ سەرتاسەر؛ سەراسەر؛ سەراسا: ۱. پەڕانپەڕ؛ شەقانشەق؛ لەم سەر تا ئەو سەر 〈سراسر جهان: سەرانسەری جیهان〉 ۲. *[ادبی]* گشت؛ گشک؛ گش؛ گرد؛ گش‌لەگش؛ هەموو؛ وێکڕا؛ تێکڕا؛ پێکەوە.

**سراسری** / sarāsarî/: صفت. سەرانسەری؛ سەرتاسەری؛ سەراسەری؛ سەراسایی؛ گشتی؛ هەموانی؛ پێوەندیدار بە هەموو شوێنێکی هەرێم یان ولاتێکەوە 〈راەآهن سراسری؛ انتخابات سراسری: هێلی ئاسنی سەرانسەری؛ هەلبژاردنی سەراسەری〉.

**سراسقف** / sarosqof ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ معرب از یونانی] /اسم. ئوسقوفی گەورە؛ سەرۆک ئوسقوفێ کە سەرۆکایەتی ئوسقوفەکانی‌تری لە ناوچە یان ولاتێکدا بە دەستە.

**سراسیمگی** / sarāsîmegî/: /اسم. شلەژاوی؛ سەرسامی؛ دەسەپاچەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەر لێ شێوان؛ دامان؛ سەرسام بوون 〈در همە جا سراسیمگی بە چشم می‌خورد: لە هەموو جێگەیەکدا شلەژاوی بەرچاو بوو〉.

**سراسیمه**[1] / sarāsîme/: صفت. *[ادبی]* شلەژاو؛ سەرسام؛ دەسەپاچە؛ سەرلێ‌شێواو؛ هوویل؛

حۆل؛ گێژ؛ واج؛ هاج؛ هاژ؛ تاس؛ تاساو؛ هەوول؛ واقوڕ؛ واقوڕماو؛ هەوڵ؛ وڕ؛ سەراسیمە؛ شڵەژاو و حەپەساو بە هۆی ڕووداوێکی لەنەکاو ‹از دیدن من سراسیمە شد: بە دیتنی من شڵەژا›: **آسیمەسر** *[/ادبی/]*

**سراسیمه**[۲]: *قید.[/ادبی/]* سەرسام؛ دەستەپاچە؛ سەرلێشێواو؛ بە هەشتاو و هەیەجانی زۆرەوە بە هۆی ڕووداوێکی نەکاو ‹سراسیمە از پلەها بالا رفت: سەرسام لە پلیکانەکانەوە چووە سەرێ›: **آسیمەسر** *[/ادبی/]*

**سراشیب** / sarāšîb/: *صفت.* سەرەولێژ؛ سەرەوخوار؛ سەرەوژێر؛ سەرەونشێو؛ سەربەرەژێر؛ سەربەرەوژێر؛ سەربەرەوخوار؛ سەرەوچێر؛ سەرەووار؛ ڕوو بە لای ژێروو؛ بە لێژیەکی ڕوو بە خوارەوە ‹از یک خیابان سراشیب پایین رفتیم تا رسیدیم بە در باغ: لە شەقامێکی سەرەولێژەوە داگەڕاین تا گەییشتینە بەر دەرکی باخەکە›.

**سراشیبی** / sarāšîbî ، ـها/: *اسم.* لێژایی؛ لێژی؛ سەرەولێژی؛ سەرەولێژایی؛ سەرنشێوی؛ سەرنشێڤی؛ سەربەرەژێری؛ سەربەرەولێژایی؛ بەرەوخوارە؛ سەرەوخوارکێ؛ سەرنسوڤ؛ کووڕ؛ خەزگ؛ خەشیقولک؛ بوار بە باری بەرەوخوارەوە.

**سراغ** / sorāq/: [ترکی]*اسم.* نیشان؛ نیشانی؛ ناونیشان؛ گێژ؛ سەر و شوێن؛ شوێن؛ دەوس؛ بنە؛ نونگ.

▣ **سراغ داشتن**: شک بردن؛ بەدی کردن؛ ناسین؛ لە هەبوونی شتێ یان کەسێ لە جێگایەک بە ئاگا بوون ‹آپارتمان خالی برای اجاره سراغ داری؟: وارخانی بەتاڵ بۆ کرێ شک دەبەی؟›. هەروەها: **سراغ نداشتن**

**سراغ کردن**: دیتنەوە؛ سۆسە/ سووسەکردن؛ قەرەکردن؛ سۆراغ کردن؛ کەردەیوە بنە؛ سەبارەت بە جێگە یان دۆخی شتێ یان کەسێک ئاگایی بە دەست هێنان ‹برایم کاری سراغ کردە است: کارێکی بۆم دیوەتەوە›.

**سراغ کسی رفتن**: بە شوێن کەسێکدا چوون؛ بۆ دۆزینەوە و دیتنی کەسێک ڕۆیشتن ‹رفت سراغ دکتر: چووە بە شوێن دوکتوردا›.

**سراغ گرفتن**: شوێن گرتن؛ شوێن هەڵگرتن؛ قەرەگرتن؛ وێکەوتن؛ لە شوێن گەڕیان؛ سۆراغ کردن/ گرتن؛ لەمەڕ نیشان و شوێنی کەس یان شتێک پرس و جۆکردن.

**بە سراغ چیزی رفتن**: ڕۆیشتن/ چوون بۆ شتێک؛ بە/ لە شوێن شتێکدا چوون؛ چوونە دەم شتێکەوە؛ سەردەموو چێویەوە لوەی؛ بۆ دەست خستن یان بە کار هێنانی شتێک ڕۆیشتن ‹دزد رفتە بود سراغ صندوق: دز ڕۆیشتبوو بۆ سندووقەکە›.

**سرافراز** / sarafrāz ، ـان/: *صفت.* سەربەرز؛ سەرفەراز؛ سەرفیراز؛ سەربڵند.

**سرافرازی** / sarafrāzî ، ـها/: *اسم.* سەربەرزی؛ سەرفەرازی؛ سەربڵندی.

**سرافکندگی** / sarafkandegî/: *اسم.* سەرشۆڕی؛ شەرمەزاری؛ سەرلەبەری؛ سەرنەوەری؛ سەرنزمی؛ سەرکزی؛ سەروهاری؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرشۆڕ بوون.

**سرافکنده** / sarafkande/: *صفت.* سەرشۆڕ؛ سەرنەوی؛ سەرنەمە؛ سەرنزم؛ سەرنەوەر؛ سەروهار؛ سەرداخستوو؛ سەرکز؛ سەربەرە ژێر؛ سەرلەبەر؛ شەرمەزار و خەجاڵەت، بەتایبەت بە هۆی شکست یان ڕسواییەوە ‹پس از فرار دخترش پیش دوستانش سرافکندە شد: دوای هەڵاتنی کچەکەی لای دۆستانیەوە سەرشۆڕ بوو›.

**سرامد** / sarāmad/: *صفت.* گرۆبەر؛ هەڵکەوتە؛ ژێهاتی؛ سەرامەد؛ موودە؛ سەرتر لە هەمووان.

**سرامیک** / serāmîk ، ـها/: [فرانسوی]*اسم.* سرامیک؛ کاشی؛ سەرامیک؛ بەرهەمی سواڵەتی بە خاکەبەرد و کائۆلین تۆژدراو.

**سرامیکی** / serāmîkî/: [فرانسوی] صفت. سرامیکی؛ سەرامیکی؛ لە جنسی سرامیک.

**سرانجام**[1] / sarancām/: اسم. سەرەنجام؛ سەرئەنجام: ۱. دوایی؛ دمایی؛ دماهی؛ دواخری؛ ئاخر؛ قۆناغی دوایینی ڕەوتێک ‹معلوم نیست سرانجام این کار چه از آب درآید: دیار نیە سەرئەنجامی ئەم کارە چۆن دەبێ› ۲. ئاکام؛ برانەوەی کار؛ بەرهەم و دەسهاتی چالاکیەک ‹این کار سرانجامی نخواهد داشت: ئەم کارە سەرئەنجامێکی نابێ›.

▣ **سرانجام دادن**: گەیاندنە ئەنجام؛ کۆتایی پێ هێنان؛ دوایی هێنان؛ سامان دان؛ ئاردەیوە کۆ؛ هێنانە بەر؛ وەبەر هێنان؛ هێنانە بەرهەم؛ پێ‌گەیاندن؛ گوڤتاندن؛ بە ئاکامی دڵخواز گەیاندن ‹وقتی کار باغ را سرانجام داد، به شهر برگشت: کاتێ کاری باخەکەی گەیاندە ئەنجام، گەڕایەوە بۆ شار›.

**سرانجام داشتن**: ئاکام هەبوون؛ دەسهات هەبوون؛ بەرهەم هەبوون ‹تلاشهای شبانەروزی او سرانجامی نداشت: تێکۆشانی ڕۆژ و شەوی (ئەو) ناکامیکی نەبوو›.

**سرانجام یافتن**: بە ئاکام گەیشتن؛ کۆتایی هاتن؛ دوایی هاتن؛ پێکهاتن ‹کار تأسیس کارخانه سال پیش سرانجام یافت: کاری دامەزرانی کارخانەکە ساڵی پێشوو بە ئاکام گەیشت›.

**سرانجام**[2]: قید. لە ئاکامدا؛ لە کۆتاییدا؛ سەرەنجام؛ سەرئەنجام؛ دواخری؛ دوماخر؛ دەس‌ئاخر؛ ئاخری ‹سرانجام ما پیروز شدیم: لە ئاکامدا ئێمە سەرکەوتین›.

**سرانداز** / sarandāz، ـها/: اسم. سەرەناز: ۱. [ادبی] سەرناز؛ سەرپۆش؛ ئەوەی سەر و ملی پێ‌دادەپۆشن (وەک سەروێن، چارشێو و...) ۲. لاکێش؛ کەنارە؛ مافوورەی درێژۆکە ۳. دیرەک؛ کاریتە؛ شاتیر؛ تیرحەماڵ.

**سراندن** / sorāndan/: مصدر متعدی. //**سراندی**: خزاندت؛ **می سرانی**: دەخزێنی؛ **بسران**: بخزێنە// خزاندن؛ خزانن؛ خزنەی؛ خزنای؛ خلیسکاندن؛ خشاندن؛ خشکاندن؛ تەهساندن؛ شەمتاندن؛ ڕەت پێ‌دان؛ سوڕ دان؛ وەڕێ خستنی شتێک بە سەر ڕووپەڕێکی لێژ یان لووسدا. هەروەها: **سُراندنی**

■ مصدر منفی: **نَسراندن** (نەخزاندن)

**سرانگشت** / sarangošt، ـها؛ ـان/: اسم. ترت؛ سەرپەنجە؛ سەرئەنگوست؛ گوفک؛ سەری قامک؛ کومێ تللی؛ بەشی دواینی ئەنگوست بۆ گرتن و دەست پێدا هێنان.

**سرانگشتی**[1] / sarangoštî/: صفت. [مجازی] گۆترە؛ برە؛ هەڕەمە ‹حساب سرانگشتی: حەساوی گۆترە›.

**سرانگشتی**[2]: قید. گۆترمە؛ بە قامک؛ بە پەنجە؛ بە شێوەی حەسێب بە قامک ‹همین جا سرانگشتی حساب کن!: هەر لێرە گۆترمە حیسابی کە!›.

▣ **سر انگشتی حساب کردن**: گۆترمە حیساب کردن؛ بە برە حەساوکردن.

**سرانه**[1] / sarāne/: اسم. سەرانە: ۱. سەر؛ ماوە؛ باقی؛ ئەوەی بە هۆی نرخ جیایی دوو شت لە دان و ستانێکدا دەدرێ یان وەردەگیرێت ‹ساعتم را با ساعتش عوض کردم، ۱۰۰۰ تومان هم سرانه گرفتم: سەعاتەکەم دەگەڵ سەعاتەکەی گۆڕیەوە و ۱۰۰۰ تمەنیش سەرم گرت› ۲. [قدیمی] ساوەری؛ پیتاکی؛ باجێ کە لە کەسێک وەریاندەگرت.

**سرانه**[2]: صفت. سەرانە؛ پێوەندیدار بە هەر کەسەوە ‹جیرەی سرانه: مووچەی سەرانە›.

**سرانه**[3]: قید. سەرانە؛ بە پێی سەر؛ بۆ هەر کەسێک ‹سرانه تقسیم کرد: سەرانە بەشی کرد›.

**سرای** / sarāy، ـها/: اسم. [ادبی] ماڵ؛ یانە؛ سەرا؛ خانوو ‹سرای آخرت: ماڵی دوایی›.

**ـ سرای** / sarāy, sorāy/: پیواژه. [ادبی] ــ هۆن؛ ـ ڤان؛ هۆنەر ‹ترانەسرای: لاوک‌هۆن›.

**سرایت** / serāyat, sarāyat، ـها/: [عربی] اسم. ستیرمە؛ گیرۆیی؛ داگری؛ تەشەنا؛ تەشەنە؛

چۆنیەتی لێگرتنەوە؛ ڕاگواستنی دۆخێک (وەک نەخۆشین، پێکەنین و ...) لە یەکێ بۆ یەکێکی‌تر.

⊡ **سرایت کردن**: ۱. پەرە سەندن؛ پەرە گرتن؛ گوێزانەوەی دۆخ یان حاڵەتێک (وەک نەخۆشی، پێکەنین، پەژارە، شورش و...) لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی‌تر ۲. تەنینەوە؛ تەنایوە؛ تەشەنا/ تەشەنەکردن؛ پەرەگرتن؛ لێگرتنەوە.

**سرایت‌کننده** / serāyatkonande, sarāyat- ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. گیرۆدار؛ پەرەگر؛ بە تایبەتمەندی ڕاگوێزران یان کاریگەر بوون لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی‌تر.

**سرایدار** / sarāydār, serāy- ، ـها؛ ـان/:اسم. پاشماڵە؛ پاشمارە؛ ژێرماڵە؛ قاپچی؛ دالاندار؛ پاسەوانی سەرایەک.

**سرایداری** / sarāydārî, serāy-/:اسم. پاشماڵەیی؛ ژێرماڵەیی؛ کار یان پیشەی دالاندار.

**سرایه** / sarāye ، ـها/:اسم. پاویوون؛ ژووری تایبەتی حەسانەوەی بژیشک لە نێو نەخۆشخانەدا.

ـ **سرایی** / sarāyî, sorāyî/: پیوازه. ـ هۆنی ‹ترانەسرایی: لاوک‌هۆنی›: ـ **سرائی**

**سراییدن** / sarāyîdan, sorāyîdan/ ۱. ☜ **سرودن**: **سرائیدن** ۲. خوێندن؛ خوەندن؛ بە دەنگ و ئاهەنگ خوێندنەوە.

**سرب** / sorb/:اسم. سورب؛ سرپ؛ سرفت؛ سەرمی؛ مزا؛ قورقوشم: ۱. توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ۸۲ و کێشی ئەتومی ۲۰۷،۲۰، نەرم و چەکوچخۆر و بۆرە ۲. هەر کام لە دەسهاتگەلێ کە لەو کانزایە ساز دەبێ.

**سربار**[1] / sarbār/:اسم. سەربار؛ سەروار؛ چەمپاڵ؛ ناییش‌سەر؛ لنگە بار یان بەستەیێ کە لە سەر باری حەیوانی باربەری دەنێن: **سرباری**

**سربار**[2]: صفت. [مجازی] سەربار؛ سەربارە؛ خاوەن خۆ و خدە یان هۆگرەتی بە ئەرک و زەحمەتی خۆ خستنە ئەستۆی دیتران یان ژیان بردنە سەر بە دەسڕەنجی کەسانی‌تر.

⊡ **سربار شدن**: بوونە سەربار؛ ئەرک و زەحمەتی خۆ خستنە سەر شانی دیتران. هەروەها: **سربار بودن**

**سرباره** / sarbāre/:اسم. خلت و خەوشێ کە لە دوای توانەوەی کانزا بە سەریەوە کۆ دەبێتەوە.

**سرباری** / sarbārî/ ☜ **سربار**[1]

**سرباز**[1] / sarbāz ، ـها/:اسم. سەرباز؛ سەرواز؛ بالباز: ۱. /ـان/ کەسێ کە لە هێزی چەکداری، بەتایبەت ئەرتەشدا خزمەت دەکا و خوارترین پلەکی چەکداری هەیە ۲. /ـان/ کەسێ کە لە کاتی بە سەر بردنی ماوەی خزمەتیدایە ۳. /ـان/ [مجازی] کەسێ کە بۆ شەڕکردن ئامادەی چەک هەڵگرتنە ‹سرباز وطن؛ سرباز آزادی: سەربازی نیشتمان؛ سەربازی ڕزگاری› ٤. [شطرنج] پیادە ٥. یەکێ لە وەرەقگەلی کایەی پاسوور.

**سرباز**[2]: صفت. [گفتاری] ۱. سەرپەتی؛ سەرەپەتی؛ سەرڕووت؛ سەرەڕووت؛ سەرقۆتین؛ سەرقۆتی؛ سەرقۆت؛ سەرخواس؛ سەرکۆڵ؛ بەبێ پۆشەنی سەر ‹خانمها روسری داشتند، امّا دخترها سرباز بودند: ژنەکان سەروێنیان هەبوو، بەلام کچەکان سەرپەتی بوون› ۲. سەرباز؛ سەر ئاوەلا؛ سەرهەڵدرپاگ؛ دەرڤەکری؛ سەربەتاڵ؛ سەربەتاک؛ بێ بەسە و سەرپوشی ڕێک‌وپێک ‹چند تا قرص از یک قوطی سرباز ریخت توی پاکت: چەن دانە حەبی لە قوتوویەکی سەرباز هەڵرژاندە نێو پاکەتێکەوە›.

**سرباز**[3]: قید. ۱. بە سەر پەتی سەر ڕووت؛ سەرپەتی؛ سەرڕووتی؛ بە سەری ڕووتەوە ‹این‌طور سرباز بیرون نرو: ئاوا بە سەر پەتی مەچۆ دەرەوە› ۲. سەرتاک؛ سەرباز؛ سەرئاوەلا؛ بەبێ درگا و سەر نانەوە ‹غذا را این‌طور سرباز نگذار: چێشتەکە وا سەرتاک مەهێلەوە›.

**سربازخانه** / sarbāzxāne ، ـها/:اسم. [گفتاری] سەربازگە؛ قژڵە؛ قشڵە؛ سەربازخانە؛

سەروازخانە؛ سپاگە؛ پادگان؛ بنکەی چەکداری دەوڵەت.

**سربازگیری** / sarbāzgîrî/: *اسم.* سەروازبگیر؛ سەربازگیری؛ سەربازگری؛ کار یان ڕەوتی بانگێشتن، بردن یان دامەزراندنی کەسان بۆ سەربازی.

**سربازی**[1] / sarbāzî/: *اسم.* سەربازی؛ سەروازی: ۱. دۆخ یان چۆناوچۆنی سەرباز بوون ‹او از سربازی نفرت داشت: ئەو ڕقی لە سەربازی بوو› ۲. خزمەت؛ ئەرکی چەکداری ‹او را بردند بە سربازی: ئەویان بردە سەروازی› ۳. دەورانی سەرباز بوون ‹سربازی من در آن شهر گذشت: سەربازیم دەو شارەدا تێپەڕ بوو›.

**سربازی**[2]: *صفت.* سەربازی؛ سەروازی؛ پێوەندیدار بە سەربازەوە ‹کلاه سربازی: کلاوی سەربازی›.

**سربال** / sarbāl/: *اسم. [کالبدشناسی]* سەرئێسک؛ هەر یەکە لە دوو سەری ئێسکگەلی درێژی لەش کە لەگەڵ ئێسکی‌تردا دەبنە جمگە، لە سەرەتادا کرۆژنەیین و دوایی دەبنە ئێسک.

**سربالا**[1] / sarbālā/: *صفت.* ۱. سەرەوژوور؛ بەرەوژوور؛ سەر بەرەو ژوور؛ سەرەکۆ؛ بەرەوسەر؛ بە لێژی ڕووەوسەر. بەرانبەر: **سرازیر** ‹این خیابان سربالا را کە بروی، می‌رسی: ئەم شەقامە سەرەوژوورە ئەگەر بڕۆی دەگەیتێ› ۲. *[مجازی]* لالووت؛ ناحەز؛ دڵنەویست؛ ناخۆش ‹جواب سربالا: وەرامی لالووت›.

**سربالا**[2]: *قید.* سەرەوژوور؛ بەرەوژوور؛ سەرەوکۆ؛ ڕووەوسەر؛ سەرەڤراز؛ بەربژۆر؛ ڕوو بە بان ‹شیشە را سربالا بگیر کە نریزد: شووشەکە سەرەوژوور بگرە با نەڕژێ› ۲. *[مجازی]* بە لالووت؛ نەبەدڵی ‹سربالا جواب می‌دهد: بە لالووت وەرام دەداتەوە›.

**سربالائی** / sarbālā'î/ ☜ **سربالایی**

**سربالایی** / sarbālāyî ، ـها/: *اسم.* بەرەوژووری؛ سەرەوژووری؛ بەرەوژوورکێ؛ بەرەوژوورکە؛ سەرەوژوورکایی؛ سەرە و ژوورە؛ بەرەوژوورە؛ بەربژۆری؛ سەرەوکۆیێ؛ بنار؛ ئەڤرازی؛ هەورازی؛ هەڤراز؛ ئەڤراز؛ ئەرڤاز؛ هەوراز؛ بڵندایی؛ بڵندی؛ ڕووەو بڵندی؛ بوارێ کە بەری بەرەو بانە. بەرانبەر: **سرازیری؛ سرپایینی** ‹این سربالایی را کە تمام کنیم، بە چشمە می‌رسیم: ئەم بەرەوژوورییە تێپەڕ کەین، دەگەینە کانی›: **سربالائی**

**سربتو** / sarbetû/ ☜ **سربەتو**

**سربراه** / sarberāh/ ☜ **سر بەراه**

**سربرغ** / sarbaraq ، ـها/: *اسم.* بەنگا؛ بەنگە؛ شێلەگە؛ شەلەگە؛ کەلەوەری ئاو؛ جێگای داشکانی جۆگە لە چۆم.

**سربرهنە** / sarberehne/: *صفت. [ادبی]* سەرڕووت؛ سەرپەتی؛ سەرخواس؛ سەرکۆڵ؛ بە سەری بێ‌سەروێن.

**سربزیر** / sarbezîr/ ☜ **سر بە زیر**

**سربرگ** / sarbarg ، ـها/: *اسم.* سەرنامە: ۱. لاپەڕەیێ کە لە لای سەرووییەوە، ناو و پێناسەی دامەزراوە یان کەسێکی لە سەر چاپ کراوە ۲. ناو نیشانێ کە لە سەر قاقەزەوە چاپی دەکەن ۳. بەشێک لە پەڕەی فەرمی (وەک پەڕەی دەنگ‌دان یان وەرەقەی ئازموون) کە ناو و نیشانی تێدا دەنووسن و جوێ دەکرێتەوە * **سرکاغذ**

**سربزرگی** / sarbozorgî/: *اسم. [کنایی]* خۆ بە زل زانی؛ گەڤەزەیی؛ دەماربەرزی؛ دەمارزلی؛ ئاکارێ کە نیشانەی خۆ بە گەورە زانینی پێوەیە.

**سربستە**[1] / sarbaste/: *صفت.* سەربەستە؛ سەربەس: ۱. سەربەسراو؛ پێچراو ۲. *[مجازی]* سەرداخراو؛ داپۆشراو؛ شاراو؛ بە پێچ و پەنا؛ نەرێسات ‹حرف سربستە: قسەی سەربەستە›.

**سربستە**[2]: *قید.* سەربەستە؛ سەربەسە: ۱. بەستەیی؛ بەسەیی؛ بە شێوەی بەستەکراو ‹همین‌طور سربستە خریدم: هەروا بەستەیی سەندم› ۲. *[مجازی]* پەنامەکی؛ ناڕاستەوخۆ؛ بە پێچ و

پەناوە؛ نەرێسات؛ بە داپۆشراوی ‹باید سربسته بگویم که از خیرش بگذر!: با سەربەستە بیڵێم لێی گەڕێ!›.

**سربسر** / sarbesar/ ☜ **سربەسر**

**سربلند** / sarboland/: *صفت. [کنایی]* سەربەرز؛ سەرفەراز؛ سەربڵند: ١. خاوەن هەستی خۆش بە بۆنەی کردەوەی چاکەوە ٢. خاوەن ڕێز و ڕەوشتی ئاپۆرەیی بە بۆنەی کار یان کردەوەیێکەوە. هەروەها: **سربلند بودن؛ سربلند شدن**

**سربلندی** / sarbolandî/: *اسم. [کنایی]* سەربەرزی؛ سەرفەرازی؛ سەربڵندی؛ هەبوونی ڕێز و ستایشی جڤاتی بە بۆنەی ئاکاری چاکەوە.

**سربمهر** / sarbemohr/ ☜ **سر به مهر**

**سربند** / sarband ، ـها/: *اسم.* سەروێن؛ سەر و شەدە؛ پێچ؛ سەرپێچ؛ سەرەپێچە؛ پارچەیێ کە دەیبەستن بە سەرەوە.

**سربنیست** / sarbenîst/ ☜ **سربەنیست**

**سربها** / sarbahā/: *اسم.* پووڵ یان ماڵێ کە بۆ ڕزگار بوون لە کوژران ئەدرێ.

**سربه تو** / sarbetû/: *صفت. [مجازی]* دەروون دار؛ دەخەس؛ دڵقورس؛ بەتاقەت؛ بەرخۆگر. ٢. *[نامتداول]* سەرخوار؛ شەرمێون؛ شەرمین؛ ژێر و ماقووڵ و سەرخوار ❋ **سربتو**

**سربەراه** / sarberāh/: *صفت. [گفتاری]* ١. بەرقەوڵ؛ گوێبیس؛ گوێبیست؛ بە گوێچکە؛ گوێڕایەڵ بۆ بەڕێوەبردنی فەرمان ٢. شوێنکەوتووی بایەخ و دابی ئاکاری: **سربراه.** هەروەها: **سربەراهی**

**سربه زیر** / sarbezîr/: *صفت. [کنایی]* سەرخوار؛ مەن؛ مەند؛ کاوەخۆ و بەرفەرمان: **سربزیر.** هەروەها: **سربەزیری**

**سربه سر**[1] / sarbesar/: *صفت. [گفتاری]* سەربەسەر؛ سەروەسەر؛ دەقاودەق؛ پاکلەپاک؛ ڕاستەوڕاست؛ یەک بە یەک؛ وەک یەک. بەرامبەر: **سربسر**

**سربه سر**[2]: *قید.* پاکلەپاک؛ یەکسەر؛ پاک؛ گرو؛ گشت؛ تەق ‹همه سربەسر تن به کشتن دهیم: هەموو پاکلەپاک خۆ بە کوشتن دەدەین›: **سربسر**

**سربه فلک کشیده** / sarbefalakkešîde/: [فارسی/ عربی/ فارسی] *صفت. [مجازی]* هەوابڕ؛ زۆر بەرز.

**سربه مهر** / sarbemohr/: *صفت.* ١. سەرمۆر؛ سەر بە مۆر؛ نەکراوە؛ بە مۆری سەر بەستە یان پاکەتەوە بۆ دڵنیایی لە هەڵنەتەکاندن و دەس تێ نەبردنی ٢. *[مجازی]* سەرمۆر؛ سەنتە؛ نهێنی؛ زۆرنەپەندی ❋ **سربمهر**

**سربەنیست** / sar-be-nîst/: *صفت. [گفتاری]* ١. سەرداگوم؛ بێسەر و شوێن؛ نادیار؛ بەرپیوار؛ ناخویا؛ خیف؛ نوخوم. ٢. توونا؛ تووناوتوون؛ تەیوو؛ فەوتاو؛ لەنێوبراو ‹جوانان را می‌بردند و سربەنیست می‌کردند: لاوانیان دەبرد و توونایان دەکردن› ❋ **سربنیست.** هەروەها: **سربەنیست شدن؛ سربەنیست کردن**

**سربهوا** / sarbehavā/: [فارسی/ عربی] ☜ **سربەهوا**

**سربه هوا**[1] / sabehavā/: [فارسی/ عربی] *صفت. [گفتاری]* حۆیلەر؛ خەنۆک؛ خۆلێبوێر؛ سەرچڵ؛ خەمسار؛ گەللایی؛ کەللەیی؛ گوێنەدەر؛ کەترەخەم: **سربهوا**

**سربه هوا**[2]: *قید.* سەرشکێن؛ سەرسەری؛ خەمسار؛ لامسەرلایی؛ بە سەرچڵی؛ بەبێ تێڕوانین و ورد بوونەوە ‹این‌طور سربەهوا نشمار، کمی دقت کن!: ئاوا سەرشکێن مەیژمێرە، هێندێک ورد بەوە!›: **سربهوا**

**سربی** / sorbî/: *صفت.* سرپی؛ سوربی؛ سرفتی: ١. دروس کراو لە سرپ ٢. بۆر؛ بە ڕەنگی خۆڵەمێشی بریقەدار؛ ڕەنگی سرپی. هەروەها: **سربی‌رنگ؛ سربی‌فام**

**سرپا** / sar(e)pā/: *صفت.* ١. ☜ سرپا بودن، **سر**[2] ٢. ☜ **سرپایی**[2]

**سرپائین** / sarpā'în/ ☜ **سرپایین**

**سرپائینی** / sarpā'înî/ ☜ **سرپایینی**

**سرپاسبان** / sarpāsbān ، ـها/: اسم. سەرپاسەوان؛ گورووبان؛ کارگێڕی شارەوانی.

▣ سرپاسبان سوم: گورووبان سێهەمی شارەوانی. هەروەها: **سرپاسبان دوم؛ سرپاسبان یکم**

**سرپایی** / sarpāyî ، ـها/: اسم. سەرپایی؛ سەرپایێ؛ دەمپایی؛ پێڵاوی سووکی بێ پشت و پاژنە.

**سرپایی**: صفت. وەستاو؛ سەرپایی؛ سەرپێیی؛ بە سەرپاوە؛ بە ڕاوەستانەوە؛ بەبێ دانیشتن یان ڕاکشان: **سرپا**

**سرپایین** / sarpāyîn/: صفت. سەرەوخوار؛ سەرەوار؛ بەرەوخوار: ۱. سەرنخوون؛ سەرخوار؛ سەر بە ژێردا کەوتوو ۲. سەربەرەوخوار؛ سەر بەرەو ژێر؛ سەرەوژێر؛ سەرەولێژ؛ نشێو؛ سەرەوچێر. بەرانبەر: **سربالا** ✽ **سرپائین**

**سرپایین**: قید. سەرەوخوار؛ سەرەووار؛ ڕووبەخوار؛ بەرەو خوار ‹این‌طور سرپایین نگیرا! دارد می‌ریزد: ئاوا سەرەوخوار مەیگرە! خەریکە دەڕژێ›: **سرپائین**

**سرپایینی** / sarpāyînî/: اسم. سەرەوخوارە؛ سەرەوخوارکایی؛ بەرەوخوارکایی؛ بەرەوخوارکە؛ سەرەخوارکێ؛ بەرەخوارە؛ بەرەخوارکێ؛ سەرەوارە؛ سەرەوژێری؛ خوارایی؛ سەر بەرەو خواری. بەرانبەر: **سربالایی**: **سرپائینی**

**سرپتی** / sarpatî/: [کردی] صفت. [گفتاری] سەرپەتی؛ سەرەپەتی؛ سەرڕووت؛ سەرەڕووت؛ سەرەڕووتە (بۆ مێ)؛ سەرخواس؛ سەرکۆڵ؛ سەرقوت؛ سەرقۆتی؛ سەرقۆتین؛ بە سەری بێ‌سەروێنەوە.

**سرپر** / sarpor/: صفت. سەرپڕ: ۱. پڕ؛ پەڕ؛ گۆزان؛ دارماڵ؛ تژە؛ تژی؛ سەرڕێژ؛ لێواولێو؛ لێوانلێو؛ لرپ؛ کەفەسەر ۲. [قدیمی] دەمپڕ؛ بە تایبەتمەندی پڕ بوون لە سەری لوولەوە ‹تفنگ سرپر: تفەنگی سەرپڕ›.

**سرپرست** / sarparast ، ـها؛ ـان/: اسم. سەرپەرست؛ سەرپەرشت؛ سەرپرێس؛ سەرپەرستیار؛ سەرپەرشتیار؛ بنار؛ واهر؛ واهار؛ سەرگەڤار؛ سەرگەڤاز؛ مشوورخۆر؛ مشوورخۆرە؛ گۆهدار؛ گوهدەر؛ خێو؛ خوێ؛ ئەوی ئاگاداری دامەزراوە، ڕێکخراوە یان کەسێکی لە ئەستۆدایە و بەڕێوەی دەبات.

▣ سرپرست خانواده: سەرگەڤار؛ سەرگەڤاز؛ واهار؛ واهر؛ وائیرێن؛ سۆرگوڵ؛ بنار؛ سەرپەرستی خێزان؛ گەورەی ماڵ.

سرپرست جامعه: نیرۆی؛ سەرپەرستی کۆمەڵ.

**سرپرستار** / sarparastār ، ـها؛ ـان/: اسم. سەرپەرستار؛ پەرستارێ کە سەرپەرشتی و چاوەدێری کار و باری پەرستارانی بەشێکی نەخۆشخانە یان دەرمانگایەکی لە ئەستۆدایە.

**سرپرستی** / sarparastî/: اسم. سەرپەرشتی؛ مشوورخۆری؛ خوێداری: ۱. کار یان پیشەی سەرپەرشت ۲. ئێوەت؛ خاوەنداری؛ دەهەم؛ گۆهداری؛ گوهدێری؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرپەرشت بوون.

▣ سرپرستی کردن: حاواندنەوە؛ حەواندنەوە؛ بەخێوکردن؛ وەی‌کەردەی.

**سرپستانک** / sarpestānak ، ـها/: اسم. سەرەمەمکە؛ سەری شووشەشیری منداڵان.

**سرپناه** / sarpanāh ، ـها/: اسم. سەرپەنا: ۱. پەنا؛ پەناگا؛ جێگایەکی سەرداپۆشراو کە بکرێ لە ژێریدا پەنا بگری ۲. [مجازی] چاوەخانوو؛ خانوو؛ ماڵ ‹داشتن یک سرپناه حق همه‌ی مردم است: خاوەنیەتی چاوەخانوویەک، مافی هەموو کەسێکە›.

**سرپنجه** / sarpance ، ـها/: اسم. پەنجە: ۱. پێنج ئەنگوست بە تیکڕایی؛ قامکانی دەست ۲. پاژێک لە پێشەوەی پێ کە ئەنگوستەکانیش دەگرێتەوە ۳. سەرپەنجە؛ بەشێ لە گۆرەوا و دەسکێش کە پەنجە دادەپۆشێ.

▣ **سرپنجه گرفتن:** سەرپەنجە داگرتن؛ دوورینەوەی نووکی گۆرەوێ یان دەسکێش.

**سرپوش** / sarpûš ، ـها/: *اسم.* سەرپۆش: ١. سەرپۆشک؛ دەرخۆنە؛ دەمبێن؛ زاربێن؛ دەربێنک؛ زاربێنک؛ دەرخون؛ دەرخوین؛ دەرخووین؛ دەرخووینک؛ دەرخۆن؛ سەرک؛ خوانکە؛ دەقۆک؛ قەپاخ؛ قەپاغ؛ قەباخ؛ ئامێرێ بۆ داپۆشین و سەرنانەوەی دەفر، کەلێن یان دەمی شتێک ٢. *[کنایی]* کار یان ئامرازێک بۆ داشاردنی شتێکی نالەبار.

▣ **سرپوش گذاشتن:** *[کنایی]* شاردنەوە؛ داشاردن؛ داپۆشین؛ داپۆشان؛ داپۆشاندن؛ داپۆشانن؛ سەرپۆش نانەوە.

**سرپوشدار** / sarpûšdār/: *صفت.* سەرپۆشدار؛ بە دەرخۆنە؛ دەمبێندار.

**سرپوشیده**[1] / sarpûšîde/: *صفت.* ١. سەرگیراو؛ داپۆشراو؛ بە میچ ‹سالن سرپوشیده: سالۆنی سەرگیراو› ٢. بەسەرپۆش؛ سەرپۆشدار ‹یک دختر سرپوشیده آمد دمِ در: کچێکی بەسەرپۆش هاتە بەر دەرگا›.

**سرپوشیده**[2]: *قید. [کنایی]* نەرێسات؛ سەرپۆشراو؛ لابەلا؛ سەربەسیاگ؛ ناڕاستەوخۆ ‹سرپوشیده حالیش کردم که این کار درست نیست: نەرێسات پێم گەیاند کە ئەم کارە درووس نیە›.

**سرپهن** / sarpahn/: *صفت.* سەرپان؛ بە سەری پانەوە ‹میخ سرپهن: بزماری سەرپان›.

**سرپیچ** / sarpîč ، ـها/: *اسم.* سەرپێچ؛ کەرەسەیەکی قووڵی پێچدار کە گڵۆپی تێدەخەن و بە تێلی کارەباوە دەنێن.

**سرپیچی** / sarpîčî/: *اسم. [مجازی]* سەرپێچی؛ ملپێچی؛ ملەپێچی؛ سەرکێشی؛ مکوڕی؛ نافەرمانی؛ سەربزێوی؛ ئەشقیایی؛ کار یان ڕەوتی نەهاتنە بەر فەرمان.

▣ **سرپیچی کردن:** *[مجازی]* سەرپێچی/ ملپێچی/ سەرکێشی/ سەربزێوی/ نافەرمانی کردن؛ مل نەدان.

**سرتاپا** / sartāpā/: *قید. [گفتاری]* سەرتاپا؛ سەرتاپێ؛ لە سەرەوە تا پێ ‹سرتاپا خیس شده بود: سەرتاپا خووسابوو›.

**سرتاس** / sartās ، ـها/: *اسم.* تاس؛ سەرتاس؛ کەرەسەیەکی نیوە گرۆڤەری بە بنێکەوە، کە لە دووکانان بۆ هەڵگرتنی کالای شفتە (وەک دانەوێلە، ئاژیل، شەکر و...) و لە نێو پاکەت کردنیان کەڵکی لێ وەردەگرن: **سرطاس**

**سرتاسر** / sartāsar/: *قید. [گفتاری]* سەرانسەر؛ سەراسەر؛ سەرتاسەر؛ گشت؛ هەموو ‹سرتاسر خیابان را پیمودم: سەرانسەری شەقامەکەم دایە پاوە›.

**سرتاسری** / sartāsarî/: *صفت. [گفتاری]* سەرانسەری؛ سەراسەری؛ سەرتاسەری.

**سرتر** / sorter ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* ئامێر یان دەزگایەک بۆ هەڵوەژێران و تەکووز کردنی ئەندامانی کۆمەڵەیەک بە گوێرەی دۆزەنەیەکی دیاریکراو (وەک ڕیزکردنی ناوی خوێندکارانی پۆلێک بە پێی ئەلفوبێتکە یان جیاکردنەوەی سێو بە پێی ورد و درشتی): **سُورتر**

**سرتق** / serteq/: [ترکی؟] *صفت. [گفتاری]* لاسار؛ سەرڕەق؛ سەرشەق؛ نەگریس؛ توخس؛ چەتوون؛ لەجباز ‹خیلی سرتق است، به این آسانی دست از سرت برنمی‌دارد: زۆر لاسارە، وا سووک هاسان وازت لێ ناهێنێ›.

**سرتقی** / serteqî/: [ترکی؟] *اسم. [گفتاری]* لاساری؛ سەرڕەقی؛ سەرشەقی؛ نەگریسی؛ لەجبازی؛ چۆنیەتی لاسار بوون.

**سرتیپ** / sartîp ، ـها/: *اسم. [نظامی]* سەرتیپ؛ ئەفسەری خاوەن پلەکی سەرتیپی.

**سرتیپی** / sartîpî/: *اسم.* سەرتیپی؛ پلەکێ لە هێزی چەکداری، سەرتر لە سەرهەنگ و خوارتر لە سەرلەشکەر.

**سرتیز** / satîz/: *صفت.* نووک‌تیژ؛ سەرتێژ.

**سرجمع** / sarcam'/: [فارسی/ عربی] *قید.*

۱. سەرجەم؛ پێکەوە؛ بە یەکەوە؛ بەیەکەوە؛ تێکڕا؛ سەرپاک؛ پێوەرە؛ یوەوە؛ کترم؛ کترمی؛ لە سەر یەک؛ لە بان یەک؛ بە تێکڕایی؛ بە گشتی ‹سرجمع می‌شود ده هزار تومان: سەرجەم دەبێتە دە هەزار تمەن› ۲. لە سەر؛ لەبان ‹عیب ندارد، این هم سرجمع همه‌ی آنها: قەیدێ ناکا، ئەمیش لە سەر هەموو ئەوانە›.

**سرجنبان** / sarcombān, -conbān ، ـها؛ ـان/: اسم. ۱. [مجازی] یەکمان؛ سەرکردە؛ سەرپەل؛ ڕێبەری تاقمێ بە تایبەت کەسێ کە هاندان، بزواندن و بەڕێوەبەرایەتی گرۆیێکی سەربزێوی لە ئەستۆدایە ۲. [مجازی] کەسێ کە لە کۆمەڵگادا خاوەن ڕێز و پایەیەکی بەرزە ۳. سەرتەکێن؛ سەرلەقێن؛ کەسێ کە بە داتەکاندنی سەر، قسەی کەسی‌تر پەسند دەکا.

**سرجوخگی** / sarcûxegî /: اسم. سەرجووخەیی؛ پێگە یان پلەکی سەرجووخە.

**سرجوخه** / sarcûxe ، ـها؛ ـگان/: اسم. سەرجووخە: ۱. سەربازێ کە فەرماندەیی جووخەیەکی وەئەستوە ۲. سەربازێ کە شیاوی ئاوا کارێ یان خاوەن پلەکی سەرجووخیە.

**سرجوش** / sarcûš /: اسم. ۱. بەرکول؛ بەرکۆڵ؛ بەکول؛ بەرکەل؛ تۆزە چێشتێ کە پێش کولینی دەیچێژن ۲. سەرگول؛ سەرتەڵ؛ چێشتێ کە بە ناو باشتر، لە سەر دیگەوە هەڵیدەگرن.

**سرچپق** / sarčopoq ، ـها/: [فارسی/ ترکی] اسم. سەرە سەبیل؛ سەرە قەندە؛ سەرە قەنگە؛ سەرقەننە؛ بەشی پیاڵەئاسای بە دەمنەی سەبیلەوە لکاو کە تووتنی تێدەکەن.

**سرچراغی** / sar(e)čerāqî /: اسم. [گفتاری] هەوەڵین پارەیێ کە فرۆشیار دوای هەڵکردنی چرای دوکانەکەی (لە سەرەتای شەودا) لە کڕیاری وەردەگرێ.

**سرچسب** / sarčasb ، ـها/: اسم. سەرچەسپ؛ نیشانە کاغەزێ کە کارخانە دەیلکێنێتە سەر بەستەی کاڵاوە.

**سرچشمه** / sarčešme ، ـها/: اسم. سەرچاوە؛ سەرچاوکە؛ سەرچاوگە؛ سەرچەمە: ۱. سەرچەمە؛ سەراو؛ سەرسەراو؛ پنار؛ سەروکانی؛ شوێنێ کە چۆمێکی لێوە بەدی دێ و مەرخی لەوێوە دەست پێ‌دەکا ۲. کانی؛ هانی؛ خانی؛ سەراو؛ چاوە؛ سەرکانی؛ سەروکانی؛ سەروچاوێ؛ چاوکە؛ سەرچاوکە؛ سەرچاوگە؛ سەرچەمە؛ سەرکیەنی؛ سەرسەراو؛ سەرچاوە؛ چەشمە؛ جێ و شوێنی کانی و ئاو ۳. [مجازی] شوێنی سەر هەڵدان ‹سرچشمه‌ی این توطئه‌ها در یک سفارتخانه‌ی خارجی بود: سەرچاوکەی ئەم ساز و بازانە لە باڵوێزخانەیەکی بیانیدا بوو›.

▣ **سرچشمه گرفتن**: [مجازی] سەرچاوکەگرتن؛ سەرچاوە گرتن؛ لێ‌بوونەوە؛ سەر لێ هەڵدان؛ لێوە بەدیهاتن ‹همه‌ی این کارها از همان جا سرچشمه می‌گیرد: هەموو ئەم کارانە لەوێوە سەرچاوکە دەگرن›.

**سرچین** / sarčîn /: صفت. تەڵچن؛ تەڵبژێن؛ تەڵبژێر؛ هەڵبژاردە؛ بژاردە: ۱. هەڵبژێراو؛ تلژین؛ بە وردی هەڵچنراو ۲. [کنایی] سەرتل؛ سەرشف؛ سەرتا؛ سەرتەڵ؛ سەرگول؛ سەرچن؛ تل؛ هەرەباش و هەڵبژاردە.

**سرحال** / sar(e)hāl /: [فارسی/ عربی] ☜ سرحال بودن، **سر**[۲]

**سرحد** / sarhad(d) ، ـها؛ ـات/: [فارسی/ عربی] اسم. مەرز؛ سنوور؛ کەوشەن؛ کەرخ؛ جەسپەر؛ چیلە؛ ناونی؛ سەرحەد؛ سەرپەڕ.

**سرحدی** / sarhad(d)î /: [فارسی/ عربی] صفت. سنووری؛ کەوشەنی؛ مەرزی.

**سرحلقه** / sarhalqe ، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. [مجازی، ادبی] سەرکان؛ سەرگەورە؛ سەرمەزن؛ گەورەی تاقمێ کە لە کۆڕێکدا کۆ دەبنەوە.

**سرخ**[۱] / sorx /: اسم. سوور؛ سۆر؛ سوویر؛ سوهر؛ سوخرە؛ قرمز؛ لە ڕەنگەلی سەرەکی وەک

ڕەنگی خوێنی تازە: **قرمز**[گفتاری] ٢. درێژترین شەپۆلی تیشکی دیار، تیشکی تاقەڕەنگی نێوان ٦٢٢ تا ٧٧٠ نانۆمیتر. هەروەها: **سرخ‌رنگ؛ سرخ‌فام**

**سرخ**[2]: *صفت.* سوور؛ سۆر: ١. گوڵناری؛ بە ڕەنگی سوور ‹سیب سرخ: سێوی سوور› ٢. *[مجازی]* شۆڕشگێڕانە؛ شۆڕشی؛ خوێنین؛ خوازیاری کردەوەی توند و تیژ ٣. *[مجازی]* کومونیست؛ شیوعی.

▣ **سرخ شدن:** سوورەوە بوون؛ سوور بوونەوە: ١. بە ڕەنگی سوور هەڵگەڕان ‹از خجالت سرخ شد: لە شەرمدا سوور بووەوە› ٢. تاودران؛ قەمران؛ برژان ‹سیب‌زمینی توی روغن سرخ شد: سێفەزەمینیەکە لە ڕۆنەکەدا سوورەوە بوو›.

**سرخ کردن:** ١. قەلاندن؛ قەمراندن؛ سوورکردنەوە؛ سوورەو کردن؛ سوورەوە کەردەی؛ لە ڕۆندا تاودان و برژاندن ٢. سوورکردن؛ بە ڕەنگی سوور دەرێنان.

**سرخ ـ**[3]: *پیشوازه.* سوور ـ ؛ سوورە ـ ؛ سور ـ ؛ بە ڕەنگی سوور ‹سرخفام: سوورکار›.

**سرخاب** / sorxāb/: *اسم.* ١. *[قدیمی]* سووراڤک؛ سووراو؛ سوهراڤ؛ سۆراڤ؛ دەرمانێ سوور کە ژنان بۆ جوانی لە گۆنایانی هەڵدەسوون ٢. ـها/ سوورەقولینگ؛ سوورە قاز؛ فلامینگۆ.

**سرخاب‌وسفیداب** / sorxāb-o-sefîdāb, -sifîdāb/: *اسم. [گفتاری]* ١. سووراو ـ سپیاو؛ دەرمانی خۆ جوان‌کردن ٢. *[مجازی]* ئارایشت؛ تاس و لووس؛ بەزەک؛ خۆ ڕازاندنەوە.

▣ **سرخاب و سفیداب کردن:** *[تعریض]* سووراو ـ سپیاوکردن؛ خۆ تیل‌کردن؛ خۆ تاس و لووس دان؛ ڕوومەتی خۆ جوان‌کردن.

**سرخابی**[1] / sorxābî/: *اسم.* سوور تەڵخ؛ ڕەنگی سووری ئاماڵ بەنەوش، کە لە تێکەڵاوی ڕەنگی سوور و ئاوی پێک دێ. هەروەها: **سرخابی‌رنگ**

**سرخابی**[2]: *صفت.* سوور تەڵخ؛ بە ڕەنگی سووری ئاماڵ بەنەوش.

**سرخانه** / sarxāne/: *صفت.* سەرماڵ؛ ناوماڵ؛ ناوماڵە ‹حمام سرخانه: گەرماوی ناوماڵ›.

**سرخباد** / sorxbād/ ☜ باد سرخ، **باد**[1]

**سرخ‌بید** / sorxbîd/ ☜ بید سرخ، **بید**

**سرخپوست** / sorxpûst ، ـها؛ ـان/: *صفت.* سوورپێست؛ سۆرپێست؛ سەر بە یەکێک لە چوارگرۆی گەورەی ڕەگەزی مرۆ، خەڵکی قوڕنەی ئەمریکا و دوورگەکانی ئوقیانووسی ئارام، بە پێستی قاوەیی ڕۆشنەوە.

**سرخپوستی** / sorxpûstî/: *صفت.* سوورپێستی؛ سوورپێستانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە سوورپێستان ‹کلبەی سرخپوستی: کەوێڵی سوورپێستی›.

**سرخپوش** / sorxpûš/: *صفت.* سوورپۆش؛ خاوەن پۆشەنێک بە ڕەنگی سوور.

**سرخ‌ترسی** / sorxtarsî/: *اسم.* سوورپەرێزی: ١. *[روانشناسی]* ترسی نائاسایی لە ڕەنگی سوور (بەتایبەت خوێن) کە ببێتە هۆی نەخۆشی ٢. *[مجازی]* دۆخی ورە بەردان و ترسی زۆر لە کومونیسم یان کومونیستان.

**سرخجه** / sorxce/: *اسم.* سوورێژک؛ سوورێژکە؛ سوێرێژک؛ نەخۆشیەکی ئاستەمی ویرووسی وێنەی سوورێژەیە کە یاو، چۆڕە، داییسانی ناوپۆشی چاو، زیپکەی سوور و گەورەبوونەوەی لوولەگەلی لەنفاوی لە نیشانەکانیە.

**سرخدار** / sorxdār ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ کردی] *اسم.* هەڤریسک؛ عەرعەر؛ داری بەرزی لێڕەواری هەمیشە سەوز: **زرنب؛ سرخه‌دار**

**سرخر** / sarxar/: *صفت. [تعریض]* بەڵای بۆگەن؛ بەڵای بەد؛ سەرەخەر ‹تا می‌خواستم دو کلمه با دختر همسایه حرف بزنم، کلفتشان می‌آمد و سرخر می‌شد: تا دەهاتم دوو قسە لەگەڵ کچە هاوسێکەمان بکەم، کلفەتەکەیان وەک بەڵای بۆگەن دەهات›.

▣ **سرخر شدن:** بوونە بەڵای بۆگەن؛ بۆ زەحمەت

دان هاتن؛ بۆ درووس کردنی دەردیسەر و زەحمەت هاتن.

**سرخرگ** / sorxrag ، ـها/:اسم. سوورەدەمار؛ خوێنبەر؛ ڕەگی خوێن ڕاگوێزان لە دڵەوە بۆ ئەندامان.

**سرخرو** / sorxrû/: صفت. ڕووسوور: ۱. دەم و چاو سوور؛ ڕوومەتسوور بەتایبەت بە بۆنەی شایی و لەش ساغیەوە ۲.*[کنایی]* شاد و بەختەوەر بە هۆی سەرکەوتنەوە.

**سرخس** / saraxs ، ـها؛ ـان/:اسم. سیپەلە؛ سیپەرە؛ باوەشێنە؛ نێرووک؛ سەفرابەر؛ گولداڕوو؛ کەرەوزەکێویلە؛ بارپرە؛ مناڵەڕەش؛ بەرەزا؛ قژی کچ؛ قژی کەنیشک؛ پەلی سیاوەشان؛ ڕیشی پیرەمەرانە؛ گیاییکی پایا، بە پارچە گەڵای بێددانەوە کە دەژێریدا خاڵگەلی وردی بریقەداری زەرد هەیە.

**سرخط** / sarxat(t) ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. سەردێڕ؛ ناو یان بابەتی وتارێ کە لە سەریەوە دەنووسرێ.

◘ سرخط اخبار: سەردێڕی هەواڵ؛ کورتەی هەواڵ.

**سرخک** / sorxak/:اسم. سوورێژە؛ سوڕێژە؛ سورێژە؛ سوورێژە؛ سوورێجە؛ سیرۆژە؛ سۆرگ؛ سۆرک؛ سوورک؛ سووریک؛ سووریکە؛ سوورکە؛ سوورێکە؛ سوورلێ؛ سۆژک؛ سوژک؛ سوورکێ؛ گەزنە؛ ئەسپە؛ نەخۆشیەکی زۆر ئاستەمی ویرووسی کە بە یاو، زیپکە و ئاوەچۆڕەوە سەر هەڵدەدا و لە منداڵاندا زۆر گیرۆیە.

**سرخکن** / sorxkon ، ـها/:اسم. ئامرازێکی کارەباییە بۆ باش سوورەوەکردنی بڕێ خواردەمەنی بە کار دێ.

**سرخ مو** / sorxmû/: صفت. مووسوور؛ قژسوور: **موسرخ؛ موقرمز**

**سرخنای** / sorxnāy/ ☜ **مِری**

**سرخود**[1] / sar(e)xod/: صفت. ۱.*[گفتاری]* سەرخەر؛ سەرەخەر؛ لاسار؛ خۆسەر؛ گوێش نەداپنە؛ ناگۆشگیر ۲. لەخۆ؛ لە سەرخۆ؛ هی خۆ؛ وێرای شتێ بە شێوەی بەشێ لەو شتە ‹آستین سرخود: قۆڵ لەخۆ›.

**سرخود**[2]: قید. *[گفتاری]* لەخۆوە؛ بەخۆوە؛ سەرەخۆ؛ خۆسەرانە؛ بێپرس؛ بۆ خۆی ‹سرخود خانه خریده: لەخۆوە چووە خانووی کڕیوە›.

**سرخور** / sarxor/: صفت. *[مجازی، فرهنگ مردم]* سەرەخۆرە؛ سەرخۆر؛ سەرەوەر؛ بە دۆخ یان چارەنووسێ کە بە شووم و هۆی مەرگی تاکێکیتر (وەک داک و باب یان هاوسەر) بزانرێ.

**سرخوردگی** / sarxordegî ، ـها/:اسم. *[مجازی]* بە خۆدا شکاوی؛ خۆبانی؛ دڵسارپی؛ خەفەتخانی؛ وەڕەزی و ناهومێدی بە هۆی شکست و نامرادی لە کار یان نەگەیشتن بە ئامانجێک.

**سرخورده** / sarxorde/: صفت. *[مجازی]* بە خۆداشکاو؛ ناهمێ؛ دلسارد؛ خەفەتخان؛ خۆبان.

**سرخوش** / sarxoš/: صفت. ۱. شاد؛ دەماخ؛ وەش؛ خۆشحاڵ؛ سەرکەیف؛ بەکەیف؛ دڵشاد ۲. سەرخۆش؛ سەرووەش؛ مەست؛ تەلەس.

**سرخوشی** / sarxošî ، ـها/:اسم. ۱. شادی؛ خوەشحاڵی ۲. سەرخۆشی؛ سەرووەشی؛ مەستی.

**سرخەدار** / sorxedār/ ☜ **سُرخدار**

**سرخی** / sorxî/:اسم. سووری؛ سووریتی؛ سووراتی؛ سۆهری؛ سوورایەتی؛ چۆنایەتی سوور بوون.

**سرد** / sard/: صفت. سارد؛ سەرد؛ سار؛ تەزی؛ ڕونج: ۱. بە تینێکی کەمتر لە تینی دەرەکی لەش کە دەبێتە هۆی هەست بە ناڕەحەتی یان سەرما ‹هوای سرد: هەوای سارد› ۲. بە تینێکی کەمتر لە تینی ڕەچاوکراو ‹چای سرد: چای سارد› ۳. گەرمەوەنەکراو؛ گەرمەو نەوگ ‹خوراک سرد:

آب سرد: خۆراکی سارد؛ ئاوی سارد› ٤. چایگ؛ چیا؛ چێیگ؛ چێیی؛ تەزی؛ وەبەر سەرما نراو ‹نوشیدنی سرد: خواردنەوەی سارد› ٥. *[مجازی]* سارد و سڕ؛ سڕ؛ بەبێ هەست و وروژانی دەروونی ‹نگاه سرد: مەیزی سارد›.

▣ **سرد بودن:** سارد بوون؛ سەرد بیەی: ١. چایی بوون؛ چایگ بوون ‹آب سرد است: ئاوەکە ساردە› ٢. *[مجازی]* سارد و سڕ بوون؛ گوڕ و تین نیشان نەدان ‹رفتارش خیلی سرد بود: ئاکاری زۆر سارد بوو›. هەروەها: **سرد شدن**

**سرد کردن:** ساردکردنەوە؛ سەردەوەکەردەی: ١. فێنکەوکردن؛ هێنانە خوارەوەی دەما ‹شیر را کمی سرد کن: شیرەکە کەمێ سارد کەوە› ٢. *[مجازی]* دڵساردکردنەوە.

**سرداب** / sardāb/ ☜ **سردابه**

**سردابه** / sardābe ، ـها/: *اسم.* سەرداڤ؛ سارداو؛ سەرداو؛ سارداوە؛ ئاڤسارک؛ زاخۆن؛ ماران؛ مەسنا؛ ناویس؛ سارنج؛ ژێرخانی قووڵ کە ئاڵوگۆڕی دەمای زۆر کەمە، بۆیە زۆرتر بۆ هەڵگرتنی ماکی پێخۆر، بەکاردێ: **سرداب**

**سردار** / sardār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سەردار؛ سپاڕان؛ سەرکردە و ڕابەری هێزێکی چەکداری.

**سرداری** / sardārî/: *اسم.* سەرداری: ١. سەرۆکی؛ ڕابەری ٢. *[قدیمی]* حشکاوس؛ خەفتان؛ ئیشکاوس؛ جۆرێک پاڵتاوی بەرۆک بەسراوی بێ یەخەی پیاوانە.

**سردبیر** / sardabîr ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سەرنووسەر؛ سەرەکنووسەر؛ سەرنڤیسەر؛ سەرنڤیسکار؛ سەرپەرشتی نووسەرانی بلاوکراوەیەکی دەورەیی یان کۆمەڵەوتارێ، کە کاری کۆکردنەوە و ڕێکوپێککردن یان چاوەدێریانی وە ئەستۆیە. هەروەها: **سردبیری**

**سردخانه** / sardxāne ، ـها/: *اسم.* سەردخانە: شوێنێکی بەسراو و تینپارێز کە دەزگاگەلی سەرمادەر بۆ لە خۆ ڕاگرتنی سەرما تێیدا کار دەکەن و لە گەنینی ئەوی تێدایە بەرگری دەکات.

**سردر** / sardar ، ـها/: *اسم.* سەردەر؛ سەردەرگا: ١. زفقێل؛ سەردەرانە؛ سەربەرە؛ سەرەوەی دەرگا ٢. جوانکاری سەرەوەی درگای خانوو.

**سردرختی** / sarderaxtî ، ـها/: *اسم.* میوەیەک کە هێشتا بە دارەوەیە.

**سردرد** / sardard/ ☜ **درد**[2]

▣ **سر درد گرفتن:** سەرئێشەگرتن؛ سەرێشە گرتن؛ سەر ئێشان؛ ژانەسەرگرتن. هەروەها: **سردرد داشتن**

**سردرگم** / sardargom/: *صفت.* ١. شێواو؛ هاڵۆز؛ ئاڵۆز؛ تێکهالاو؛ هاڵۆزاو؛ هەمگم؛ بێسەرە و بەرە؛ گرفنج؛ گرفنچ؛ هەربل؛ شێواو و تێکەوە پێچیاو بە شێوەیێ کە سەرەکەی نەدۆزرێتەوە ‹کلاف سردرگم: پاری شێواو› ٢. *[مجازی]* سەرلێشێواو؛ ڕێ لێون بووی وا کە نەزانێ بە کوێدا بڕوا ‹ناگهان در پیچ و خم غار سردرگم شد و مسیری را که آمده بود، گم کرد: لە کتوپڕدا لە پێچەڵپووچی ئەشکەوتەکەدا سەری لێ شێوا و ئەو ڕێگە لێوە هاتبوو لێی گوم بوو› ٣. *[مجازی]* حەپەساو؛ پەشێواو؛ شاش؛ پەشۆکاو؛ پەشۆکیاگ؛ حەیران و بێ توانستی بڕیاردان.

▣ **سردرگم شدن:** هەبلین؛ هەربلین: ١. ئاڵۆزان؛ تێکهالان؛ بێسەرە و بەرە بوون ٢. *[مجازی]* سەر لێشێوان؛ سەرگەردان بوون؛ پەشۆکیان؛ حەپەسان.

**سردرگمی** / sardargomî ، ـها/: *اسم.* *[مجازی]* شێواوی: ١. هاڵۆزی؛ ئاڵۆزی؛ تێکهالاوی؛ هەمگمی ٢. سەر لێ شێواوی؛ شاشی.

**سردست** / sardast/: *اسم.* ١. باڵەکە؛ باڵەکێ؛ گۆشتی باڵی ئاژەڵ ٢. /ـها/ سەرقۆڵ؛ سۆرانی؛ فەقیانە.

**سردسته** / sardast ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* سەردەستە؛ سەردەسە؛ یەکمان: ١. سەربەند؛ ڕێبەری

دەستە؛ پێشەنگی دەستە ۲. سەرگەورە؛ سەرۆک؛ ڕێبەر و پێشەوای گرۆیەک.

**سردستی** / sardastî/: *قید. [گفتاری]* بە سەر دەستەوە؛ بە پەلە؛ لە ماوەیەکی کورتدا ‹سردستی دو خط بنویس بده دستش: بە سەردەستەوە دوو خەتی بۆ بنووسە و بیدەیە›.

**سردسیر**[1] / sardsîr/: *اسم.* زۆزان؛ سەردەسێر؛ سەردسێر؛ کوێستان؛ کێوسان؛ ئێلاخ؛ ئێلاخ؛ لەیلاخ؛ کۆساڵ؛ ناوچەیەک کە هاوینانی فێنک و زستانانی شەختەیە ‹از گرمسیر بە سردسیر رفتن: لە گەرمیانەوە بۆ زۆزان چوون›.

**سردسیر**[2]: *صفت.* سەردەسێر؛ سەردسێر؛ زۆزان؛ بە نێوانە دەمای کەمتر لە °۲۰ سانتیگراد.

**سردسیری** / sardsîrî/: *صفت. [گفتاری]* سەردەسێر؛ سەردسێر.

**سردفتر** / sardaftar، ـها؛ ـان/: [فارسی/ معرب] *اسم.* سەردەفتەر؛ سەرپەرشتی نووسینگەی بەڵگەی ڕەسمی.

**سردکن** / sardkon، ـها/: *اسم.* چیلر؛ ساردۆکەر؛ ساردەوکەر.

**سردکننده** / sardkonande، ـها/: *اسم.* ۱. ساردەوەکەر؛ ساردۆکەر؛ ساردکەرەوە؛ هەر جۆرە دەزگایێ کە سەرما وەدی بێنێ ۲. تەنێ کە بە هۆی کاردانەوەی کیمیایی سەرما بەرهەم دێنێ.

**سردم** / sardam، ـها/: *اسم.* ۱. سەکۆی جێ دانیشتنی مورشیدی زۆرخانە ۲. خانەقا؛ جێگەی کۆ بوونەوەی دەروێشان.

**سردماغ** / sardamāq/: [فارسی/ عربی] *صفت. [گفتاری]* گوربز؛ گوربزە؛ ساز؛ بەدەماخ؛ کەیفخۆش. هەروەها: **سر دماغ بودن**

**سردمدار** / sardamdār، ـها؛ ـان/: *اسم.* ۱. *[مجازی]* سەرۆک؛ بەڕێوەبەری زنجیرە کار و چالاکی گرۆیێ ۲. پرسەگێڕ؛ کارگێڕی پرسە؛ شینگێڕ ۳. مورشیدی زۆرخانە.

**سردمزاجی** / sardmezācî, -mazācî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* ساردمەزاجی؛ کەمی یان نەبوونی حەزی جنسی. هەروەها: **سردمزاج**

**سردوزی** / sardûzî، ـها/: *اسم. [خیاطی]* سەردروو؛ دروونێ کە تەقەڵەکان بە دەرەوە بن.

**سردوشی** / sardûšî، ـها/: *اسم.* ۱. شریتەیەکی باریک کە بۆ ڕازاندنەوەی سەرشانی بڕێ جلوبەرگ کەڵکی لێ دەگرن ۲. باریکە پارچەیەک بۆ سەرشانی چەکداران کە پلەکیانی پێوە دەلکێنن: **پاگون**

**سردوگرم** / sard-o-garm/: *اسم. [مجازی]* تاڵ و سوێر؛ سارد و گەرم؛ سەرد و گەرم؛ ئەزموونگەلی جۆراوجۆری ژیان: **گرم و سرد**

▣ **سرد وگرم چشیدن**: *[مجازی]* تاڵ و سوێر چەشتن؛ وریا بوونەوە بە هۆی ئەزموونی خۆش و ناخۆشی ژیان.

**سردوگرم‌چشیده** / sard-o-garmčešîde، ـها/: *صفت. [مجازی]* تاڵ و سوێر چەشتوو؛ لە ژین خاراو؛ بە ئەزموون.

**سردی** / sardî/: *اسم.* ساردی؛ سەردی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی سارد بوون ‹سردی هوا: ساردی کەش› ۲. ئەزموون و بۆچوونێکی کۆن سەبارەت بە تایبەتمەندی بڕێ پێخۆر و خواردنەوە کە دەبێتە هۆی دابەزینی گەرما و هێزی گشتی لەش ‹خیار سردی است: خەیار ساردیە›.

▣ **سردی کردن**: ساردی کردن؛ سەردی کەردەی؛ چیامانی کێشتەی؛ هەست کردن بە کزی، بێ‌حاڵی یا دڵهەڵشێوان بە هۆی خواردنی بڕێ پێخۆر و خواردنەوەوە ‹حتماً سردی کرده، عسل بخورد، خوب می‌شود: دیارە ساردی کردووە، هەنگوین بخوا، چا دەبێتەوە›.

**سردیس** / sardîs، ـها؛ ـان/: *اسم.* کۆتەڵی سەری مرۆ یان گیاندار.

**سرراست**[1] / sar.rāst/: *صفت.* سەرڕاس؛ سەرڕاست: ۱. ڕاستەوڕاست؛ ڕاستەوخۆ؛

شتێک لە سەری ۲. خلیسکێن؛ خزکێ؛ خزەکانێ؛ خزخزەکانێ؛ خژخژان؛ خشخشان؛ کەرەستەیەکی کایەی زارۆکانە بۆ بە سەریەوە خزان.

▣ **سرسرەبازی:** خلیسکانێ؛ خلیسکێن؛ خزخزەکانێ؛ خلیسکێنێ؛ خلووزگێ؛ کایەیێکی مندالانە بە شێوەی خۆ خزاندن بەسەر شوێن یان کەرەسەیەکی تایبەتی ئەو کارە.

**سرسری** [1] / sarsarî/: *صفت.* سەرچڵ؛ سەرسەری؛ کەمتەرخەم؛ سەرپۆرت؛ تەوڵباز؛ تەوەل؛ سەکەماتی؛ سەرپۆت؛ گەللایی؛ سەرەڕۆ؛ بەبێ سەرنج دان و شوێندا چوون.

**سرسری** [2]: *قید.* بە سەرچڵی؛ سەرشکێن؛ سەرسەری؛ گۆترمە؛ لاسماڵ؛ بە گۆترە؛ بێ تێڕوانین ‹سرسری درس خواندن: بە سەرچڵی دەرس خوێندن›.

**سرسلامتی** / sarsalāmatî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* سەرسلامەتی؛ سەرخۆشی؛ سەرەخۆشی؛ ئەوەی بۆ هاودەردی و بە مەبەستی دڵدانەوەی خاوەن مردوو دەگوترێ.

▣ **سرسلامتی دادن:** سەرەخۆشی لێ کردن؛ سەرسلامەتی دانەوە؛ پرسە و سەرەخۆشی کردن.

**سرسلسله** / sarselsele ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* سەرکان: ۱. سەرڕەتەوە؛ دامەزرێنەری بنەماڵەیەک لە پادشایان ۲. پێشەوا؛ سەرپەل؛ پێشەنگ و دەسپێکەری کارێ کە دەستەیەک پێی پەرژاون.

**سرسنگین** / sarsangîn/: *صفت.[مجازی]* لالووت؛ نەبان لە ئاست دیتران. هەروەها: **سرسنگینی**

**سرسوزن** / sarsûzan ، ـها/: *اسم.* سەرەدەرزی؛ سەرەچەن؛ سەری ئاودۆزک.

**سرسیلندر** / sarsîlandr ، ـها/: [فارسی/ فرانسوی] *اسم.* سەرسیلەندر: ۱. سەرپۆشێ کە بەشی دوایی سیلەندری گاز دادەپۆشێ ۲. کڵاوەی موتۆر کە سیلەندرەکان دادەپۆشێ و لەوێوە سووتەمەنی دەڕژێتە ناو موتۆرەوە.

**سرسینه** / sarsîne/: *اسم.* سەرسینگ؛ گۆشتی سینگی مەڕ و ماڵات.

**سرشاخ** / saršāx/: *صفت.* شاخ بەشاخ؛ سەرشاخ؛ بە حاڵەتی کێبەرکێ یان شەڕ و هەمبەر بوونەوە (وەک زۆرانبازان یان ئاژەڵی شاخدار).

▣ **سرشاخ شدن:** شاخبەشاخ بوون؛ سەرشاخ بوون؛ تووشیار یان سەرقاڵی شەڕ و داوا بوون.

**سرشاخه** / saršāxe ، ـها/: *اسم.* سەرچڵ؛ سەرلەق؛ چڵەپۆپە؛ بەشی دواییینی لق.

**سرشار** / saršār/: *صفت.[ادبی]* دارماڵ: ۱. پڕاوپڕ؛ پڕبەپڕ؛ لڕپ؛ تەژی؛ تژی؛ لێواولێو؛ لێوانلێو؛ لێوان؛ کەفەڕێژ؛ پڕ؛ پەڕ؛ لیپ ۲. زۆر و زەبەند؛ زۆر؛ زەبەند؛ فرە ‹ثروت سرشارِ از رنج مردم است: ماڵی زور و زەبەندت لە خوێنی خەڵکە›.

**سرشاری** / saršārî/: *اسم.[ادبی]* دارماڵی؛ پڕاوپڕی؛ پڕی؛ لێوانلێوی؛ کەفەڕێژی؛ زەبەند و زۆری؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی پڕ بوون.

**سرشانه** / saršāne ، ـها/: *اسم.* سەرشان: ۱. بەشێک لە جل و بەرگ کە شانە دەلکێنێتە قۆڵەوە ۲. ناوشان؛ ئەو بەشە لە جل و بەرگ کە شان دادەپۆشێ.

**سرشت** / serešt/: *اسم.[ادبی]* سوروشت؛ سرووشت؛ سرشت؛ گەوهەر؛ چییەتی خۆیی و پێکهاتەی بنەمایی کەس یان شتێک.

**سرشتن** / sereštan/: *مصدر. متعدی.[ادبی]* // **سرشتی:** تێکەلاندت؛ **سرشته می‌کنی:** تێکەڵ دەدەی؛ **سرشته کن:** تێکەڵدە// تێکەڵدان؛ کەرچلاندن؛ ڤەستراندن؛ ئامیتن؛ لێکدان؛ تێکدان؛ ئاوێتە کردن؛ ئامیتە کردن؛ ئامێژە کردن؛ تێکەڵ کردنی شتێک دەگەڵ شتێکی تردا. هەروەها: **سرشتی**

■ صفت مفعولی: **سرشته** (تێکەڵاو)/ مصدر منفی:

نَسرشتن (تێکەڵ نەدان)

**سرشتی** / serештî/: *صفت.* سرشتی؛ سوروشتی.

**سرشك** / sereš̌k, serešg/: *اسم.[ادبی]* ئەسرین؛ فرمێسک؛ فرمیسک؛ هەرسی؛ هێستر؛ ئەسر؛ ڕۆنتک؛ هورمێس؛ ڕندک؛ هەستار؛ ڕۆندک؛ سوروشک: **سرشگ**

**سرشکستگی** / saršekastegî/: *اسم.[مجازی]* سەرشۆڕی؛ ڕیسوایی؛ شەرمەزاری.

**سرشکسته** / saršekaste/: *صفت.* ١. *[کنایی]* سەرشۆڕ؛ سەرنەمە؛ سەرنزم؛ شەرمەزار بەهۆی ڕووداوی ناخۆش و زۆرتر شەرمهێن ٢. سەرشکاو؛ سەر شکیاگ؛ سەرە مریا.

**سرشکن** / saršekan/: *صفت.[مجازی]* دابەش؛ سەرشکێنە؛ دابەش کراو لە نێو ئەندامانی دەستەیەکدا ‹مخارج آسفالت کوچه را میان همسایه‌ها سرشکن کردند: مەزاختی ئاسفالتی کۆڵانەکەیان لە نێو هاوسێکاندا دابەش کرد›. هەروەها: **سرشکن شدن؛ سرشکن کردن**

**سرشگ** / serešg/ ☜ **سرشک**

**سرشماری** / saršomārî/: *اسم.* سەرژمێری؛ سەرژماری؛ سەرئەژمێری؛ سەرنقیسی: ١. هەڵژمار؛ کار یان ڕەوتی سەرژمارکردن؛ بژاردنی کەسانێک لە نێو کۆمەڵگایەک ٢. *[ـها]* ئامارگری ‹سرشماری نفوس: سەرژمێری خەڵک›. هەروەها: **سرشماری شدن؛ سرشماری کردن**

**سرشناس** / saršenās ، ـها؛ ـان/: *صفت.[مجازی]* بەناوبانگ؛ سەرناس؛ بە دەنگ و ناو؛ ناودار؛ نامدار؛ ناسراو لە کۆمەڵگایەکدا.

**سرشو(ی)** / saršû(y)/: *اسم.* سەرشۆ؛ سەرشۆر؛ ماکی خاوێنکەرەوەی (وەک شامپۆ، سابوون یان هەندێ ئامیتەگەلی گیایی) سەر و قژ.

**سرشیر** / saršîr/: *اسم.* تۆ؛ تۆی شیر؛ سەرشیر؛ سەرتوێ؛ سەرتۆ؛ تۆژی؛ تۆژگ؛ کاژ؛ کاژە؛ قەیماخ؛ قەیماغ؛ پرۆتەیین و چەوری شیر کە پاش ساردبوونەوەی وەک توێژ بە سەریەوە دەبەسرێ.

**سرصفحه** / sarsafhe ، ـها/: *[فارسی/ عربی]/اسم.* سەرلاپەڕە؛ ئەوەی لە سەر پەڕەوە و جیا لە دەقی پەڕەکە نووسراوە.

**سرطاس** / sartās/: *[فارسی/ معرب]* ☜ **سرتاس**

**سرطان** / saratān/: *[عربی]/اسم.* ١. *[پزشکی]* شێرپەنجە؛ کیفژاڵە؛ قرژاڵە؛ کورنجە؛ سەرەتان؛ نەخۆشیەک بە هۆی تەشەنە کردنی بێ‌ڕادەی شانەگەلی لەش ٢. *[نجوم]* ☜ **خرچنگ ـ ١** ٣. *[تقویم]* کیفژاڵ؛ قرژانگ؛ قرژاڵ؛ چوارەمین کەلوو لە دوازدە کەلووی ساڵ، بەرانبەر بە پووشپەڕ.

**سرطانزا** / saratānzā/: *[عربی/ فارسی]* *صفت.* شێرپەنجەهێن؛ هۆ یان هۆکاری بەدیهاتنی نەخۆشی شێرپەنجە.

**سرعت** / sor'at ، ـها/: *[عربی]/اسم* خێرایی؛ تاو: ١. گورجی؛ توندی جم و جووڵ ٢. *[مکانیک]* نرخی بزووتنی بزۆکێ بە گوێرەی یەکەی کات ‹بیش از ١٢٠ کیلومتر در ساعت سرعت داشت: پتر لە ١٢٠ کیلومتر لە کاتژمێردا خێرایی هەبوو› ٣. *[گفتاری]* پەلە؛ لەز؛ خێرا لە بەڕێوە بردنی کارێکدا ‹آزاد کارهایش را به سرعت انجام داد: ئازاد بە پەلە کارەکانی کرد›.

▣ **سرعت آغازی** ☜ **سرعت اولیّه**

**سرعت انتقال**: *[مجازی]* وریایی؛ زیرەکی؛ تیژی؛ ویرایی؛ وشیاری؛ بار و دۆخی زوو تێگەیین.

**سرعت آنی**: خێرایی ساتی؛ خێرایی بزاڤی شتێکی بزۆک لە چرکەساتێکی دیاریکراودا.

**سرعت اولیّه**: خێرایی سەرەتایی/ دەسپێک؛ خێرایی تەنێکی بزۆک لە سەرەتای ڕێکەوتنیدا.

**سرعت لاکپشتی**: *[کنایی]* کیسەڵڕۆ؛ کیسەڵئاسا؛ وەک کیسەڵ؛ زۆر هێواش.

**سرعت مُجاز**: خێرایی شیاو؛ خێرایی ڕێدراو؛

خێراییەک کە نابێ لێی لابدرێ.

**سرعت یکنواخت:** خێرایی یەکهاوی/ یەکدەس/ یەکجۆر؛ خێراییەک کە ئەندازەی لە چەن ماوەکاتی بەرامبەردا، یەکسانە.

◘ **سرعت بخشیدن/ دادن:** خێرا کردنەوە؛ خێرایی پێدان؛ تونـد کردنـەوە؛ بوونـە هـۆی خێراتر بوونی شتێ ‹ماشین‌آلات جدید، بـه تولید سرعت بخشید: دەزگاوالە تازەکان بەرهەم هێنانیان خێرا کردەوە›.

**سرعت گرفتن/ یافتن:** دەور هەڵگرتن؛ دەور گرتن؛ خێرا بوونەوە ‹ماشین در سرازیری سرعت گرفت: ماشینەکە لە سەرەوخواریدا دەوری هەڵگرت›.

**سرعت‌سنج** / sor'atsanc ، ـهـا/: [عربی/ فارسی] /اسم. خێرایی پێو: ١. ئامرازی ئەندازەگرتنی خێرایی ئامێر یان کەرەستەیەکی بزۆک ٢. ئامێرێ لە کەرەستەی گواستەنی‌دا کە خێراییەکەی بە پێی کیلۆمیتر لە یەکەی کاتدا (سەعات، دەقیقە و...) نیشان دەدا.

**سرف** / serf ، ـها/: [روسی]/اسم. سرف؛ ڕەعیەت؛ ڕایەت؛ مسکێن؛ خەڵکی لادێیی لە سەردەمی فیئودالیدا کە وەک زەوی و زار دەسێنران و دەفرۆشران.

**سرفراز** / sarfarāz ، ـان/: صفت. [مجازی] سەربەرز؛ سەربڵن؛ سەربڵند؛ سەرفیراز؛ سەرفەراز.

**سرفرازی** / sarfarāzî ، ـهـا/: اسم. [مجازی] سەربەرزی؛ سەربڵندی؛ سەرفیرازی؛ سەرفەرازی.

**سرفصل** / sarfasl ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. ١. سەرەتا؛ دەسپێکی هەر بەش (لە کتێبدا) ٢. دەسپێک؛ دەسپێکانە؛ نووسراوە یان ناوی سەرەتای هەر بەشێک ٣. [مجازی] سەرەتا؛ گۆڕانکاریەکی دیار لە ڕەوتێکدا ‹کشف آتش سرفصل تازه‌ای در زندگی بشر بود: دۆزینەوەی ئاور لە ژیانی مرۆڤدا، سەرەتایێکی نوێ بوو› ٤. [حسابداری] سەرەتا؛ لاپەڕە یان بەشێک لە دەفتەری حیسابداری، لەمەڕ حیسابگەلی دیاریکراوەوە.

**سرفه** / sorfe ، ـها/: اسم. کۆخە؛ کۆکە؛ کوخ؛ کۆخی؛ کۆخت؛ کۆخک؛ کوخک؛ قف؛ قەف؛ قفە؛ قوفە؛ قۆز؛ قۆزە؛ قۆخە؛ قۆزی؛ سوەقە؛ کولهـ ؛ قوتە؛ قلخە؛ ڕەوتی هاتنە دەرەوەی لەپڕ و دەنگداری هەوای سیگەڵ بە هۆی وەخوروو هاتنی ڕێگەی هەناسە ‹سرما خورده بود و سرفه می‌کرد: سەرمای خواردبوو کۆخەی دەکرد›.

◘ **سرفه کردن:** کۆخین؛ کوخاین؛ کۆخاندن؛ کۆکین؛ قۆزان؛ قۆزیان؛ قۆزین؛ قۆزەی؛ قۆزای؛ قڵخین؛ قفین؛ قوفین؛ کلهایش؛ سوەقان؛ کۆخە/ قۆزە کردن.

**سرفه گرفتن:** کەوتنە کۆخین؛ هاتنەکۆکین؛ کەوتنەکۆکیان؛ هاتنە قۆزین؛ کەوتنە قۆزیان؛ تووشی قۆزە هاتن ‹سیگار می‌کشیدند، سرفه‌ام گرفت: جگەرەیان دەکێشا، کەوتمە کوخە›: **بە سرفه افتادن**

**به سرفه افتادن** ☜ **سرفه گرفتن**

**سرقت** / serqat ، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] دزی ‹به جرم سرقت از خانه‌ی مردم دستگیر شد: بە تاوانی دزی لە ماڵی خەڵک قۆڵبەستکرا›.

◙ **سرقت ادبی:** دزی وێژەیی؛ کار یا ڕەوتی پێناسین یان بڵاوکردنەوەی نووسراوەی دیتران بە ناوی خۆوە.

◘ **سرقت شدن:** دزران؛ دزیان؛ دزیەی؛ دزیای؛ بران؛ بریان ‹ماشینم سرقت شد: ماشێنەکەم دزرا›: **به سرقت رفتن**

**سرقت کردن:** دزین؛ بردن ‹دوچرخه‌اش را سرقت کرده بودند: دووچەرخەکەیان دزیبوو›: **به سرقت بردن**

**به سرقت بردن** ☜ **سرقت کردن**

**به سرقت رفتن** ☜ **سرقت شدن**

**سرقفلی** / sarqoflî ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم.

سەرقفلی؛ پارەیەک کە خاوەن دوکان لە کاتی کرێدانیدا لە کرێنشینی دەستێنێ.

**سرقلم** / sarqalam ، ـها: [فارسی/ معرب]/اسم. نووکەقەلەم؛ سەرقەلەم؛ نووکی قەلەم.

**سرقلیان** / sarqalyān ، ـها: [فارسی/ ؟]/اسم. سەرەقلیان؛ سەرەقەندە؛ سەرقەنگە؛ سەرەقەننە؛ سەری نێرگەلە؛ تیکەیەکی ناو بەتاڵ، کون-کون و گرۆڤەری لە سەر قلیانەوە بۆ ئاگر و تەماکۆ تێ‌کردن.

**سرک** / sarak/: اسم. [گفتاری] سەرتاتکێ؛ سەرەتاتکێ؛ ملەتاتکێ؛ ملەقوتە؛ ملەقوتێ؛ هەڵقوت؛ هەڵقورت؛ کاری ڕوانین بۆ جێگا یان شتێک بە شێوەی بەرزکردنەوەی سەر یان لەشی خۆ.

▣ سرک کشیدن: مل‌کێشان؛ سەرکێشان؛ سەر قوتان: ١. کورت و سەرسەری بە شتێکدا ڕوانین ‹سرکی کشیدم ببینم بچەها چە می‌کنند: ملێکم کێشا بزانم منداڵەکان چی دەکەن› ٢. [مجازی] سەرەتاتکێ کردن؛ ملەقوتەکردن؛ سەر هەڵێنان؛ هەڵقوتان؛ هەڵقورتان؛ بە دزەوە ڕوانین بۆ سەردەرهێنان ‹کسی از پشت درخت سرک می‌کشید: یەکێ لە پشتی دارەکەوە ملی دەکێشا›.

**سرکار**[1] / sarkār/: اسم. ١. سەرکار؛ سەرناوێکی بەڕێزانە بۆ ئەندامانی هێزی چەکداری خوارتر لە سەرهەنگ ٢. خان؛ خات؛ خاتوو؛ سەرناوێک بۆ ژنان.

▣ سرکار عِلیه: پووری؛ خات؛ خاتوو؛ جێ‌ناوی ڕێزگرانە بۆ ژنان.

**سرکار**[2]: ضمیر. بەڕێزتان؛ ئێوە؛ جێ‌ناوی ڕێزگرانە بە جێگای تۆ ‹سرکار رفتید: بەڕیزتان ڕۆیشتن›.

**سرکارگر** / sarkārgar ، ـها؛ ـان/: اسم. سەرکاریگەر؛ سەرعەمەڵە؛ کاریگەرێ لێزان کە چاوەدێری کاری کرێکاران دەکا.

**سرکاغذ** / sarkāqaz/: [فارسی/ چینی] ☜ سربرگ

**سرکج** / sarkac/: صفت. سەرکەچ؛ سەرگۆچ؛ سەرلار؛ سەرخوار؛ بە سەر یان بەشی پێکاری خوار (لە چاو دەستە یان کۆتەرەیەوە) ‹بیل سرکج؛ میخ سرکج: پێمەڕەی سەرکەچ؛ بزماری سەرگۆچ›.

**سرکردگی** / sarkardegî/: اسم. سەرپەلی؛ سەرکردەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرکردە بوون ‹او را بە سرکردگی برگزیدند: بە سەرپەلی هەڵیانبژارد›.

**سرکرده** / sarkarde ، ـها؛ ـگان/: اسم. سەرپەل؛ سەرکردە؛ سەرکەردە؛ ڕێبەر یان سەرۆکی گرۆیەک ‹سرکردەی راهزنان؛ سرکردەی شورشیان: سەرپەلی چەتەکان؛ سەرکردەی ئاژاوەچیان›.

**سرکش**[1] / sarkeš ، ـها/: اسم. سەرکلاو؛ سەرکێش؛ هێڵی چەوت بۆ سەر پیتی کاف و گاف.

**سرکش**[2] / ـها؛ ـان/: صفت. [مجازی] سەربزێو؛ سەرکێش؛ سەرکەش؛ سەرزەیە؛ سەرچەوت؛ ملەپێچ؛ نافەرمان؛ هۆگر یان بە خۆ و خدەی سەر نەهاوردنە ڕێوە ‹اسب سرکش؛ بچەی سرکش: ئەسپی سەرکێش؛ منداڵی سەربزێو›.

**سرکشی** / sarkešî ، ـها/: اسم. [مجازی] سەرکێشی: ١. سەربزێوی؛ نافەرمانی؛ سەرکەشی؛ یاخیگەری؛ سەرشێتی؛ سەرچەوتی؛ ملەپێچی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرکێش بوون ‹دیگر سرکشی نمی‌کند: ئیتر سەربزێوی ناکا› ٢. دیمانە لە کەس، جێگە یان شتێک بۆ ئاگادار بوون لە بار و دۆخی ٣. کار یان ڕەوتی ڕاگەیشتن ‹از وقتی نتوانستم بە باغچە سرکشی کنم، علف همە جا را گرفتە است: لەو کاتەوە نەمتوانیوە سەرکێشی باخچەکە بکەم، گژ و گیا هەموو جێگایەکی داگرتووە›.

**سرکنسول** / sarkonsûl ، ـها/: [فارسی/ فرانسوی] /اسم. سەرکونسوول؛ سەرۆکی کونسوولگەریەکانی وڵاتێ لە وڵاتێکی‌تردا.

**سرکنگبین** / serkangabîn/ ☜ **سِکَنجبین**

**سرکوب**[1] / sarkûb/ ☜ **سرکوبی**

**سرکوب**[2]: *صفت. [کنایی]* سەرکوت؛ دامرکاو؛ داتەمراو؛ تێشکاو و لە هێز کەوتوو ‹دشمن سرکوب شد؛ مخالفان را سرکوب می‌کنند: دوژمن سەرکوت بوو؛ نەیاران سەرکوت دەکەن›.

**سرکوبگر** / sarkûbgar ، ـان/: *صفت. [کنایی]* سەرکوتکەر؛ داتەمرێن؛ دامرکێن؛ هۆگر یان خاوەن خۆی سەرکوت‌کەری ‹نظام سرکوبگر: ڕژیمی سەرکوتکەر›.

**سرکوبی** / sarkûbî/: *اسم. [کنایی]* سەرکوتکەری؛ کارەڕەهاتی شکست‌دان و هێزی چالاکی و بەربەرەکانێ لێ سەندن: **سرکوب**

**سرکوفت** / sarkûft ، ـها/: *اسم. [کنایی، گفتاری]* سەرکۆ؛ سەرکۆنە؛ سەرکفت؛ سەرزەنشت وێڕای سووکایەتی.

⊡ **سرکوفت زدن:** *[مجازی]* سەرکۆنەکردن؛ سەرکفت‌کردن؛ سەرکفت لێدان؛ بەر تیر و توانج‌دان ‹دایم به من سرکوفت می‌زد که چرا خوب درس نمی‌خوانم: هەمیشە سەرکۆنەی دەکردم بۆچی دەرس ناخوێنم›.

**سرکوفت کسی را به دیگری زدن:** *[مجازی]* تانەی کەسێک لە کەسێ‌تر دان؛ بە بۆنەی سەرپشکی یان سەرکەوتنی کەسێ، کەسێکی‌تر لۆمەکردن ‹دایم سرکوفت پسرعمویم را به من می‌زدند: هەمیشە تانەی ئامۆزاکەمیان لێم دەدا›.

**سرکوفته** / sarkûfte/: *صفت. [کنایی]* سەرکوت‌کراو؛ داتەمراو؛ دامرکاو ‹آرزوهای سرکوفته: ئاواتگەلی سەرکوت‌کراو›.

**سرکه** / serke/: *اسم.* سرکە؛ سێک؛ سهک؛ سیهک؛ تەوشێکی ترش کە لە کردوکۆی باکتریگەلی ترشێنەر لە ئەلکولی تراودا بەرهەم دێ و ترشی پێ دروست دەکەن.

⊡ **سرکه انداختن:** سرکە نانەوە؛ سرکە خەفاندن؛ ترشاندنی ماکە شەکریەکان (بەتایبەتت میوە) بۆ سازکردنی سرکە.

**سرکه‌ای**[1] / serke'î/: *اسم.* سرکەیی؛ ڕەنگی بەنەوشی کاڵ.

**سرکه‌ای**[2]: *صفت.* سرکەیی: ۱. بە ڕەنگی بەنەوشی کاڵ ۲. سرکاوی؛ لە سرکەدا گەوزاو ‹دستم سرکه‌ای شده است: دەستم سرکەیی بووە›.

**سرکه‌شیره** / serkešîre/: *اسم.* سرکە و دۆشاو؛ تێکەڵاوی سرکە و دۆشاوی ترێ و ئاو کە شەربەتێکی وەکوو سکەنجەبین وایە.

**سرگذشت** / sargozašt، ـها/: *اسم.* بەسەرهات؛ سەرگۆت؛ سەربردە؛ سەربهوردە؛ سەربهوردی؛ سەربهوردوو؛ سەرگوروشتە؛ سەرگورشتە؛ سەرگوزەشتە: ۱. سەمەرە؛ سەربووری؛ هەواڵی ڕووداوگەلی پێوەندیدار بە کەس یان شتێکی دیاریکراوەوە ‹سرگذشت پرواز انسان: بەسەرهاتی فڕینی مرۆڤ› ۲. نووسراوەی پێوەندیدار بەو ڕووداوانەوە ‹سرگذشت پاستور را می‌خواندم: بەسەرهاتی پاستۆرم دەخوێندەوە› ۳. ژین‌نامە؛ ژیان‌نامە ‹سرگذشت مردان نامی: بەسەرهاتی پیاوانی ناودار›.

**سرگران** / sargerān/: *صفت. [مجازی]* ۱. لالووت ۲. لووت‌بەرز؛ خۆ بە زل‌زان؛ گەوەزە؛ قاپان؛ بە دەعیە و دەمار.

**سرگرانی** / sargerānî/: *اسم. [مجازی، ادبی]* ۱. لالووتی ۲. لووت‌بەرزی؛ خۆ بە زل‌زانی.

**سرگرد** / sargord ، ـها/: *اسم.* سەرگورد؛ ئەفسەرێ کە خاوەنی پلەی سەرگوردیە.

**سرگردان** / sargardān/: *صفت. [مجازی]* مشەخت؛ سەرگەردان؛ سەرگندان؛ باهێر؛ سەر لێشێواو؛ لەوچە؛ قەوچە؛ چاش؛ شاش؛ پەشێواو؛ چارچاڤ؛ گەوشەک؛ کلافە؛ کلافە؛ دەسەسەر؛ تەیا؛ تیا؛ وێڵ؛ وەیلان.

⊡ **سرگردان کردن:** سەر لێ‌شێواندن؛ تەرتلاندن؛ شاش کردن؛ باهێر کردن؛ گێژ

کردن.

**سرگردانی** / sargardānî، ـها/: *اسم. [مجازی]* سەرگەردانی؛ سەرلێشێواوی؛ چارچەشی؛ چارچاڤی؛ باهێری؛ تیایی؛ شاشی: ١. بار و دۆخی نەدۆزینەوەی ڕێگای گەیشتن بە مەبەست ‹پس از مدتی سرگردانی در جنگل، به کلبه‌ی جنگلبان رسیدم: پاش ماوەیەک سەرگەردانی لە جەنگەڵدا گەیشتمە کەوێلی جەنگەڵبان› ٢. بار و دۆخی نەناسین یان نەزانینی مەبەستی خۆ ‹در آن سرزمین به دنبال کسی می‌گشتم که مرا از آن سرگردانی نجات دهد: لەو ولاتەدا لە کەسێ دەگەڕام کە لەو سەرگەردانیە ڕزگام کات›.

**سرگردی** / sagordî/: *اسم.* سەرگوردی؛ پلەی چەکداری بانتر لە سەروان و خوارتر لە سەرهەنگ.

**سرگرم** / sargarm/: *صفت. [مجازی]* سەرقاڵ؛ سەرگەرم؛ خەجڵ؛ لێلێ؛ خەریک؛ خەرکاو؛ مژول؛ مژویل ‹سرگرم کار بودم که تلفن زنگ زد: سەرقاڵی کار بووم تەلەفوون لە زەنگی دا›.

▣ **سرگرم شدن**: سەرقاڵ بوون؛ سەرگەرم بوون؛ خلافان؛ خلەفان؛ غافلان؛ هەڤژین؛ تاوژین؛ پەرژان؛ پەرژیان؛ خەریک بوون؛ گەرم بوون؛ گەرم ڕاهاتن؛ پێچیانە کارێکەوە. هەروەها: **سرگرم بودن**

**سرگرم کردن**: سەرقاڵ کردن؛ سەرگەرم کردن؛ خاوانن؛ خاواندن؛ خافلاندن؛ خلافاندن؛ خلەفاندن؛ خلافنەی؛ خلاونای؛ خەجلنای؛ خەریک کردن؛ خلافانن؛ خەریک کردن بە کارێکەوە.

**سرگرمی** / sargarmî، ـها/: *اسم. [مجازی]* سەرگەرمی: ١. لیستەک؛ خۆخلافکێ؛ کازە؛ چالاکیەک بۆ ڕابواردن، خافلاندن و حەسانەوەی زەین ‹جوان به سرگرمی نیاز دارد: گەنج پێویستی بە سەرگەرمی هەیە› ٢. مژولاهی؛ خەریکی؛ پژگاڵ؛ مژولی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرگەرم بوون ‹این کار باعث سرگرمی می‌شود: ئەم کارە دەبێتە هۆی سەرگەرمی›.

**سرگروه** / sargurûh, -gorûh، ـها/: *اسم.* سەرپەل؛ سەردەستە؛ دەمسپی؛ کەسێ کە ڕێبەرایەتی گرۆیەکی وە ئەستۆیە.

**سرگروهبان** / sargurûhbān, -gorûhbān، ـها/: *اسم.* سەرگرووبان؛ سەرگرووهبان؛ پلەکداری هێزی چەکداری.

**سرگروهبانی** / sargurûhbānî, -gorûhbānî/: *اسم.* سەرگرووبانی؛ سەرگرووهبانی؛ پلەکێک لە هێزی چەکداری بانتر لە گرووبان دووهەمی و خوارتر لە ئوستواری.

**سرگشاده** / sargošāde/: *صفت.* ١. سەرئاواڵە؛ سەرگوشاد؛ سەرواز؛ بێسەرپۆش ٢. ☜ نامەی سرگشاده، **نامه**

**سرگشتگی** / sargaštegî، ـها/: *اسم.* تێماوی؛ سەرلێشێواوی؛ سەرلێشێویاگی؛ مشەختی؛ سەرسامی؛ حەپەساوی؛ سەرسووڕماوی؛ سەرزڤڕانی؛ سەرماسیوی؛ داماوی لە بڕیاردان و لێبڕان.

**سرگشته** / sargašte، ـها؛ ـگان/: *صفت. [ادبی]* حەپەساو؛ تێماو؛ سەرسام؛ پەشێو؛ پەشێویاگ؛ پەشۆکاو؛ سەرماسیو؛ هاژ؛ عەبەساو؛ سەرسووڕماو؛ سەرزڤڕانی ‹پدر نیز سرگشته‌ی کار خود بود: باوکیشم حەپەساوی کار و باری خۆی بوو›.

**سرگیجه** / sargîce/: *اسم.* سەرگێژە؛ سەرەگێژە؛ سەرگێژی؛ سەرگێجە؛ سەرەسوووڕە؛ سەرەخولێ؛ هەستی سووڕانەوەی دەوروبەر بە دەوری سەر، یان خولانەوەی کەس بە دەوری خۆیدا.

**سرگین** / sergîn، ـها/: *اسم. [ادبی]* سەنێر؛ سەنیر؛ سنێر؛ سەرگین؛ سەرین؛ سەوڤر؛ سەورۆ؛ سۆن؛ سوهان؛ لاس؛ تەرس؛ لاز؛ لاسک؛ ڕیخ؛ شیاکە؛ ترۆڵ؛ تەردە؛ جەللە؛ چۆسلە؛ چەمین؛ گووی چارویان.

**سرگین‌غلتان** / sergînqaltān، ـها/: *اسم.*

گووخلێنکه؛ گووخلێنه؛ گـووگلێن؛ گووگـەڕین؛ گووخرتەوکەرە؛ گووبەرە؛ گام گلـۆس؛ گـی گلـو؛ گـی گلـە؛ گووپلـدەر؛ گـی‌پلـدەرە؛ خلێنکـە؛ ڕیـخ‌گلێنـە؛ کێـز؛ کێـزک؛ گاوزالـک؛ گازولـک؛ مێروویەکی لەش‌پان و قاپلۆخ‌ڕەقـی لـە تـیرەی قالۆچە کە پێگەیوەکانیان، گزموولەی شیاکە بـۆ گەرا تێکردن خڕ دەکەنەوە: **پِهن‌غلتانک؛ جُعَل**

**سرگینگاه** / sergîngāh ، ـها/: *اسم.* سەرانگوێلک؛ سـەرانوێلک؛ سـەرانگۆلک؛ سـەرگوێلک؛ سـەرەنوێلک؛ سـەروانک؛ سـەرگۆ؛ سـەخوڕگە؛ ڕیخـەلان؛ لاسـگا؛ گوفـک؛ گووفـک؛ سـەنیرگا؛ سـنێرگە؛ کۆشـکەلان؛ جێگـای ڕژانـدن و کۆکردنەوەی سەنێر.

**سرلاد** / sarlād ، ـها/: *اسم. [ادبی]* سـەردیوار؛ بـان دیـوار؛ سەرپاسـار؛ کەلەکەپاسـار؛ کەلکەپاسـار؛ سـەرووی حەسـار؛ ڕیـزی سـەرووی دیـوار. بەرانبەر: **بُنلاد**

**سرلـشکر** / sarlaškar, sarlašgar ، ـهـا/: *اسـم.* سەرلەشکەر؛ سەرلەشـکر؛ قومانـدان؛ ئەفـسەری خاوەنی پلەکی سەرلەشکەری: **سرلشگر**

**سرلـشکری** / sarlaškarî, sarlašgarî/: *اسـم.* سەرلەشکەری؛ سەرلەشکری؛ پلەکی چەکـداری بانتر لـە سـەرتیپی و خـوارتر لـە سـپەهبودی: **سرلشگری**

**سرلشگر** / sarlašgar/ ☜ **سرلشکر**

**سرلشگری** / sarlašgarî/ ☜ **سرلشکری**

**سـرلوحه** / sarlowhe, -lo:he ، ـها/: [فارسـی/ عربی] *اسم.* ١. کار، کردەوە یان سیاسەتێ کە لـە سـەرووی بەرنامەگـەلی کـەس، گـرۆ یـان ڕێخراوەیەکدایـە ٢. *[قـدیمی]* ئـارم؛ نیـشانە؛ دروشم؛ هەوە ٣. *[قدیمی]* تابلۆ.

**سـرم** / serom/: [فرانـسوی] *اسم.* ١. *[فیزیولـوژی]* زەرداو؛ زیچکـاو؛ زرینچکـاو؛ زرینچـک؛ ئـاوی زولاڵ و زەردکاری خوێن کە لە خوێنی گرسـاو جیا دەبێتەوە ٢. ☜ **سـرم فیزیولوژیـک ـ ٢** *

**سروم**

**سرما** / sarmā/: *اسم.* سـەرما؛ زام؛ زمـا؛ سـەردا: ١. دەمای خوارتر لە ڕادەی ئاسایی یان دڵـخواز ٢. دەمای خوارتر لـە دەمـای ئاقـار ٣. *[فیزیـک]* دیاردەیەکی بەدی‌هاتوو لە کەم‌بوونـەوەی تـین کە دەبێتە هۆی ڕچان یـان چوونەیـەکی شـتان ٤. *[گفتـاری]* ئاقارێ کـە هەواکـەی سـاردە ‹چـرا ایستادەای توی سرما، بیا تـو: بـۆچی لـەو سـەرمایەدا ڕاوەستاوی، وەرە ژووری›.

⊡ **سرما خوردن:** *[گفتاری]* سەرما خواردن؛ سەردا واردەی؛ تووشیاری هەلامەت بوون.

**سـرما دادن:** ڕچانـدن؛ سـەرما دان؛ سـەرما لێدان؛ دانە بـەر هـەوای سـارد ‹پنجـره را بنـد همـەمـان را سـرما دادی: پەنجەرەکـە ببەسـتە هەمووشمانت ڕچاند›.

**سرما زدن:** سەرما بردن؛ لە بەر سەرما بـوون و گەزنگاز بوون ‹دیشب گلها را سـرما زده: دوێـشەو سەرما گوڵەکانی بردووە›.

**سرمائی** / sarmā'î/ ☜ **سرمایی**

**سرمابندی** / sarmābandî/: *اسم.* سـەرماپەرێزی؛ سەرماپارێزی؛ کار، ڕەوت یان زانیاری پاراستنی شوێنێک لە هەمبەر سەرماوە.

**سـرماپای** / sarmāpāy ، ـهـا/: *اسم.* سـەرماپێو؛ چەشنێ دەماپێو بۆ بەرگری لە سەرەوە چـوونی دەمای دەسگا یان جێگایەک: **زَمپای**

**سرماخوردگی** / sarmāxordegî/: *اسم. [مجازی]* پـەتا؛ هەلامـەت؛ هالمـەوت؛ ئالامـەت؛ ئارسـم؛ ئاسرم؛ پەسیو؛ پەسیڤ؛ پـسکە؛ نەکـسۆ؛ مـرک؛ پەرسێو؛ پەر؛ فرفینگ؛ دەمەنی؛ زەکەم؛ زوکـام؛ ڕەوتی نەخۆش‌کەوتن لە بەر سەرما.

**سـرمادرمانی** / sarmādarmānî/: *اسـم.* سەرمادەرمانی؛ کار یا ڕەوتی کەلک وەرگرتن لە سەرما بۆ دەرمانی برێ نەخۆشی.

**سرماریزه** / sarmārîze/: *اسم.* زوقـم؛ زەق؛ زق؛ زۆقم؛ خـویز؛ زوخـم؛ زوغـم؛ خیـسار؛ خـووس؛

خوسار؛ خازی؛ خووز؛ خوێز؛ خوێس؛ خووسار؛ سووخار؛ خوزە؛ سووخ؛ خوویس؛ سیخوار؛ زەمەگولیلک؛ شەڵتە؛ ئاڵشت؛ ئاڵشک؛ قەر؛ قورۆ؛ ئەڵماسە؛ وەرەق؛ قراقە؛ قراف؛ پژ؛ دۆخ یان ڕەوتی بەستنی شەونم لە کاتی ساردبوونی کەشدا.

**سرمازا** / sarmāzā/: *صفت.* سەرمادەر؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی بەدیهێنانی سەرما.

**سرمازایی** / sarmāzāyî/: *اسم.* ١. سەرمادەری؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەدیهێنانی سەرما ٢. زانستی لێکۆڵینەوەی دیاردەگەلی سەرما: **زَمزایی**

**سرمازدگی** / sarmāzadegî/: *اسم.* سەرمابردوویی؛ سەرماژۆیی؛ گەزەنێ کە بە هۆی سەرمای زۆرەوە بە جەستە یان ڕووەک، بەتایبەت داری میوە دەگا.

**سرمازده** / sarmāzade/: *صفت.* سەرمابردوو؛ سەرماڵێداو؛ سرپری؛ سەرماژۆ؛ سەرمابردگ؛ سەرمابردە؛ سەردابەردە؛ سەرمابردەڵ؛ تووشی سەرمابردوویی.

**سرماساز** / sarmāsāz ، ـها/: *اسم.* ساردکەرەوە؛ فێنکەوکەرە؛ فێنککەرەوە.

**سرمایش** / sarmāyeš/: *اسم.* کار یان ڕەوتی بەدیهێنانی سەرما.

**سرمایشی** / sarmāyešî/: *صفت.* پێوەندیدار یان سەر بە بەدیهێنانی سەرماوە.

**سرمایه** / sarmāye ، ـها/: *اسم.* سەرمایە؛ دەسمایە؛ دەزمایە؛ دەستمایە: ١. سەرماڵ؛ سەرمیان؛ تەنخوا؛ کۆمەڵە داراییەک کە بۆ دابینی داهات بە کار دەچێ ‹سرمایەی شرکت: دەسمایەی شیرکەت› ٢. *[مجازی]* هەیاتی؛ دارایی، چ مادی و چ مەعنەوی ‹سرمایەی نقدی: سرمایەی علمی: دەسمایەی بە نەخت؛ سەرمایەی زانستی›.

▣ **سرمایه ی اسمی**: سەرمایەیێ کە بەشدارانی بەشدارگەیەک لە سەرەتای دامەزرانیەوە دایدەنێن یان دانەوەی وە ئەستۆ دەگرن.

**سرمایه ی ثابت**: ئەو بەشە لە دارایی کەس یان ڕێخراوەیێ کە دان و سانی پێ ناکرێ (وەک ماڵ و ماشین).

**سرمایه ی در گردش**: سەرمایەیێ کە بۆ وە بەرهێنانی داهات دەساودەسی پێدەکرێ (وەک دراو، ماکی خام و کالای بەرهەمهێنراو).

**سرمایه دار**[1] / sarmāyedār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* دەسمایەدار؛ سەرمایەدار؛ مایەدار؛ کەسێ کە خاوەن سەرمایەیە، بەتایبەت کەسێ کە لە پیشەسازی یان بازرگانیدا سەرمایە دادەنێ.

**سرمایه دار**[2]: *صفت.* *[مجازی]* دەوڵەمەند؛ دەوڵەمەن؛ سەرمایەدار؛ دارا؛ بوودە؛ زەنگین؛ مایەدار؛ مایەبۆش.

**سرمایه داری** / sarmāyedārî/: *اسم.* سەرمایەداری؛ گهووردی: ١. ئابووری سەرمایەداری؛ دوزەنەیەکی ئابووری کە لەودا بەشی سەرەکی ژیانی ئابووری بەتایبەت خاوەنیەتی ئامراز و کالا سەر بە ڕێخراوە و کەسانی نادەوڵەتیە ٢. دوزەنەیەکی سیاسی کە لە سەر ئەم ئابووریە چنراوە.

**سرمایه گذاری** / sarmāyegozārî ، ـها/: *اسم.* کار و ڕەوتی بە کار خستنی دەسمایە بۆ بە دەست هێنانی قازانج.

**سرمایی** / sarmāyî/: *صفت.* *[گفتاری]* سارۆکی؛ سەرمایی؛ سەردەوچ (بۆ نێر)؛ سەردەوچە (بۆ مێ)؛ زۆر هەستۆک بە سەرما و کەمبەرگە لە بەرانبەر سەرماوە ‹سارا خیلی سرمایی است: سارا زۆر سارۆکیە›: **سرمائی**

**سرمدی** / sarmadî/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* هەمیشەیی؛ هەتایی؛ هەتاهەتایی؛ بێدوایی؛ نەبڕاوە؛ دایمی؛ هەر ماو؛ هەر هە.

**سرمست** / sarmast ، ـان/: *صفت.* *[مجازی]* ١. سەرمەست؛ سەرمەس؛ مەست؛ مەس

٢. شاد؛ سەرخۆش؛ سەرخوەش؛ سەرووەش؛ سەرگەرم ٣. لووتبەرز؛ قاپان؛ گەوەزە؛ دڤنبلند؛ ئاخایۆک؛ نەروم؛ بە دەعیە؛ خۆ بە زلزان. هەروەها: **سرمست بودن؛ سرمست شدن؛ سرمست کردن**

**سرمستی** / sarmastî/: /اسم. سەرمەستی؛ سەرمەسی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرخۆش بوون.

**سرمشق** / sarmašq ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. سەرمەشق: ١. نووسراوەیەک بۆ مەشق کردن لە روویەوە ‹امروز معلم سرمشق نداد: ئەمرۆ مامۆستا سەرمەشقی نەدا› ٢. *[مجازی]* کارێ کە مەبەستی نیشاندانی نموونەیەک بۆ چاوبڕینی دیترانە ‹رفتار پدر و مادر سرمشق بچەهاست: ئاکاری دایک و باب سەرمەشقی مندالانە› ٣. *[مجازی]* نموونە؛ نموودە؛ نمووچ؛ نمووج؛ نمانا؛ کەس یان کارێ کە دیتران چاوی لێ دەبڕن ‹تو باید سرمشق دیگران باشی: تۆ دەبێ سەرمەشقی دیتران بی›. هەروەها: **سرمشق دادن؛ سرمشق شدن؛ سرمشق گرفتن؛ سرمشق نوشتن**

**سرم‌شناسی** / seromšenāsî/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. سرۆمناسی؛ زانستی لێکۆڵینەوە لە سرۆمی خوێن، لە چی پێکهاتووە و کەڵکی چیە.

**سرم‌فیزیولژیک** / seromfîz(i)yolojî/: [فرانسوی]/اسم. *[پزشکی]* ئاوتنۆکی تێکەڵ بە هێندێک خوێ یان قەند (یا ماکێکی‌تر) بۆ تەڕکردنەوەی خوێنی خەست و دەرمان یا خۆراکێ کە لە ڕێی خوێنەوە بە نەخۆش دەدرێ: **سرم**

**سرمقاله** / sarmaqāle ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. سەروتار؛ وتاری سەرەکی بەلاڤۆکێکی دەورەیی کە زۆرتر سەرنووسەر دەینووسێ و لەمەڕ سیاسەتی بلاوکراو، ناوەڕۆک و بابەتگەلی ڕۆژ یان شتی گرنگی دیکەوە باس دەکا.

**سرمک**/ sarmak/: /اسم. پیَقاز؛ سپێناغەکێویلە؛ ڕووەکێک وەک کاهوو، کە دەیکێڵن، گەلاکەی دەکرێتە سالاد و دەنکەکەی دەبێتە هۆی ڕەوانی و ڕشانەوە.

**سرمنزل** / sarmanzel/: [فارسی/ عربی]/اسم. یۆم: ١. وارگە؛ هەوارگە؛ نشینگا؛ مال؛ خانوو؛ یانە ٢. دوا قۆناغ؛ ئامانج؛ جێگایێ کە کەسێ بە نیازی ڕۆیشتن بۆ ئەوێیە.

**سرمه** / sorme ، ـها/: /اسم. سورمە؛ کل؛ کلە؛ کل؛ کلە؛ کلەسونجانی؛ هەرچی کە چاوی پێ بڕێژن، بەتایبەت: *الف)* گەردی سولفووری ئانتیموان *ب)* گەردی سولفووری سرپ *ج)* دووکەلی کەرە.

▣ **میل سرمه** ☜ **میل**

▣ **سرمه به چشم کور کشیدن**: *[کنایی]* تۆز و خۆل کردنە خەلە؛ ئاو هەسەو کردن؛ ڕەقەن کێل کردن؛ دێمەکارکێلان؛ بۆ کەڕ خوێندن و بۆ کوێر سەما کردن؛ کاری بێ‌جێ کردن.

**سرمه را از چشم دزدیدن**: *[مجازی]* بە کونە بانا گاجووت سەر خستن؛ جوورە بە حەواوە نال کردن؛ لە دزی کردندا تەواو وەستا بوون.

**سرمه کشیدن**: ڕشتن؛ ڕەشتەی؛ ڕێژان؛ دارشتن؛ کل کرن؛ کل دەچاوکردن؛ سورمەکێشان؛ کل کێشان ‹مثل اینکه چشمهایش را سرمه کشیده بود: وەک شتێ چاوی ڕشتبوو›.

**سرمه ای** [1] / sorme'î/: /اسم. سورمەیی؛ هەورە؛ ڕەنگی شینی ئامال ڕەش: **سورمەای**. هەروەها: **سرمەای‌رنگ**

**سرمەای** [2]: صفت. سورمەیی؛ کلی؛ بە ڕەنگی شینی ئامال ڕەش: **سورمەای**

**سرمەدان** / sormedān ، ـها/: /اسم. کلدان؛ کلدان؛ کلەدان؛ سورمەدان؛ سورمەدوو؛ کەلتە؛ کلتە؛ کلتوور؛ میلیان؛ قەولەق؛ قاولغی‌کل؛ توورەکەی چکۆلەی جێگەی سورمە.

**سرمەدوزی** / sermedûzî/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. ١. چەشنێ گولدووری سونەتی وەکوو

نەخشی ترمە لە سەر شاڵ ٢. مەلیلەدووری.

**سرنا** / sornā, surnā ، ـها/: *اسم.* سرِنا؛ زرِنا؛ زورِنا؛ زورنا؛ سورِنا؛ سرِناوی؛ سازێکی باژەنە بە شێوەی لوولەیەکی سەرقووچ بە شەش تا حەوت کون و دوو زمانە لە نێو دەمنەکانیەوە کە دەنگی مووسیقایی بە فوو تێکردن و دانان و هەڵگرتنی قامک لە سەر کوناکانیەوە ڕێکی دێت: **سُورنا؛ زُرنا؛ زورنا**

▣ **سرنا را از سر گشادش زدن:** *[تعریض]* لە کلکەوە لەغاوکردن؛ کارێک بە شێوەی نادرووس و ناشیانە ئەنجامدان.

**سرناد** / serenād/: [فرانسوی از ایتالیایی]/*اسم.* *[موسیقی]* سیرناد؛ هەر یەکە لە ئاهەنگ و ئاوازگەلی ئەویندارانەی پێشووی ئورووپا.

**سرنام** / sarnām ، ـها/: *اسم.* سەرناو؛ وشە یان ناوێک کە لە پیتگەلی سەرەتای ناو یان زاراوەیەکی تێکەڵ دروست کراوە (وەک «هتد» کە سەرناوی هەتا دوایيە).

**سرنامه** / sarnāme/ ☜ **سربرگ ـ١**

**سرناوی** / sarnāvî/: *اسم.* سەرناوی؛ سەرجووخەی هێزی چەکداری دەریایی.

**سرنج** / soranc/: *اسم.* سورەنج؛ تیترۆکسیدی سرپ کە ماکێکی سوور و بریقەدارە و لە نیگارکێشی و خەتاتیدا بە کار دێ.

**سرنخ** / sarnax/ ☜ سرِ نخ، **سَر**[1]

**سرند** / sarand ، ـها/: *اسم.* سەرەن؛ سەرەند؛ سەڕەند؛ سەرەد؛ سەڕەد؛ سەڕەت؛ کەو؛ کارماخ؛ خاکبێژ؛ گلگیر؛ پەڕەیەکی تۆڕی درشت لە تێل کە بۆ جیاکردنەوەی درشت لە ورد بەکاردێ.

▣ **سرند کردن:** ١. سەڕداندن؛ دابێژان؛ سەرەن کردن؛ بە کەوا تەقانن؛ لە کەو دان؛ لە سەرەد دان؛ تەقاندنەوە؛ وێژانن؛ تەقنەی؛ جیا کردنەوەی دانەی ورد و درشت بە سەرەند ٢. *[مجازی]* تەڵبژێرکردن؛ جوداکردنەوە یان هەڵبژاردنی ئەندامانی ڕەچاوکراوی کۆمایەک.

**سرنسخه** / sarnosxe ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* لاپەڕەیەکی چاپی بە ناو و نیشانی بژیشک (یان دەرمانگا، نەخۆشخانە) بۆ نووسینی دەستووراتی بژیشکی.

**سرنشین** / sarnešîn ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سەرنشین؛ ئەوی لە کەرەستەیەکی گواستەنیدا دادەنیشێ.

**سرنشیندار** / sarnešîndār/: *صفت.* سەرنشیندار؛ بە سەرنشین.

**سرنگ** / sorang ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* شرینقە؛ سرنگ؛ سرینگ؛ ئابدۆزەک؛ ئاودۆزەک؛ ئاودووزەک؛ چەنی؛ فیچقە؛ فیشقە؛ ترومپایەکی بچووکی گرۆڤەری (لە ماکێکی ڕوون وەک شیشە یان پلاستیک) بە سەری دەرزیدارەوە، بۆ وەشاندنی دەوا لە لەشی گیاندار یان دەرکێشانی تراو.

**سرنگون** / sarnegûn/: *صفت.* سەرنخوون؛ سەرنەخوون؛ سەرنەخووین؛ سەرنوخین؛ سەرەونگوم؛ سەرەونگوون؛ ژێر و ژوور؛ ژێر و ڕوو؛ ژێر و بان: ١. سەرەونوون؛ سەراوەنوون؛ دەمەوخوار؛ دەمەونخون؛ وەرگەڕاو؛ لنگەوقووچ؛ بەراوەڕوو؛ بەراوەژوو؛ بەراوەژی؛ واژی؛ دەمەونخوون؛ بە دۆخێکی پێچەوانە و ڕوو بە خوار ٢. نخووم؛ نخوون؛ نوخن؛ قلپ؛ قلپ؛ وەبەر نەمان و تیاچوون.

▣ **سرنگون شدن:** ١. سەرنخوون بوون؛ نخوون بوونەوە؛ سەرەو نخوون بوون؛ نوخون بوونەوە؛ هەڵگەڕانەوە؛ هەڵگەڕیانەوە؛ وەرگەڕان؛ ژێر و ڕوو بوون؛ واژی بوون؛ بەراوەژوو بوون؛ ئاوەژوو بوون؛ سەرەونوون بیەی؛ ئەوەنوونیەی؛ وەڵۆدیم بیەی؛ قلپ بوونەوە؛ نوقم بوونەوە؛ قولەو ژوور بوون؛ قولب بوون؛ دەمەو خوار بوون ٢. بەر بوونەوە؛ داکەفتن؛ داکەوتن، بەتایبەت لە بەرزاییێکەوە ٣. *[مجازی]* ژێر و

ژوور بـــوون؛ هەڵـــگەڕانەوە؛ هەڵـــگەڕیانەوە؛ وەرگــەڕان؛ واژی بـــوون؛ بـــەراوەژوو بـــوون؛ سەرەونوون بیەی؛ وەڵۆدیم بیـەی؛ هێـز یـان پلەو پایە لە دەست دان ‹دولت نظـامی پاکستان سرنگون شد: دەوڵەتی چەکداری پاکـستان ژێـر و ژوور بوو›. هەروەها: **سرنگون کردن**

**ســـرنگونی** / sarnegûnî/: *اســم.* ســـەرنخوونی؛ سەرەونخوونی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی ژێرەوژوور بوون؛ هەڵگەڕانەوە ‹سرنگونی دولت نظـامی موجب خوشحالی مردم شد: سەرنخوونی دەوڵەتی چەکـداری بووە هۆی خۆشحالی خەڵک› ۲. کـار یـان ڕەوتی سەرنخوون کردن؛ هەڵـگەڕاندنەوە؛ هۆروێـڵنەی؛ وەڵـۆدیم کــەردەی ‹همـەی گروههـای سیاسـی در سرنگونی آن شرکت داشتند: هەموو گرۆە سیاسـیەکان لە سەرنخوونی ئەودا بەشدار بوون›.

**سرنگهدار** / sernegahdār/: [عربی/ فارسی] *صفت. [گفتـاری]* دەمقـــورس؛ ڕازدار؛ ڕازهەڵـــگر ‹ســارا سرنگهدار نیـست، میـرود پـیش همـه مـیگویـد: سـارا دەمقورس نیە، ئەچێ بەلای گشتەوە ئێژێ›.

**سرنوشــت** / sarnevešt/: *اســم.* چـــارەنووس؛ چــارەنویس؛ خوانـــووس؛ سەرنـــڤووس؛ یـــازی: ۱. بـــەخت و هـــات؛ قـــسمەت؛ ســـەرجەمی ڕووداوانی ژیان ۲. ئاکام؛ ئاخر و ئاکـامی ژیـانی گیاندارێک یان چۆنیەتی ڕەوتێک ‹سـگ بیچـاره سرنوشـت بـدی پیـدا کـرد: سـەگی دامـاو تووشـی چارەنووسێکی خراپ هات›.

**سرنوشت ساز** / sarneveštsāz/: *صفت. [مجـازی]* چارەنووس ساز؛ خاوەنی دەوری سـەرەکـی لـە پێکهێنان و بەدیهێنانی ژیانی داهاتوودا.

**ســـرنیزه** / sarneyze, sarnîze ، ـهــا/: *اســم.* سەرەنێزە؛ سەرنێزە؛ ســـەرەڕم؛ کورتـە نـەیزەیێ کە دەکرێتە سەری چەکەوە.

**سرو** / sarv ، ـها/: *اسم.* سـەوڵ؛ سـەلو؛ سـەلوو؛ ئەســـرۆ؛ ئەســـروو؛ سەلـــڤی؛ ســـەرو؛ ئـــاژەوەن؛ ئارەوەن؛ دارناژ؛ داری چواروەرز شینی گەڵا زبـر و چـڕ بـە میـوەی قووچـەکی و کۆتـەرەی ئەستوورەوە کە تا ۲۵ و ۳۰ میتر بەرز دەبێ.

▣ **سرو کوهی:** سەوڵە کیفـی؛ سەلـڤی کێـوی؛ ناوی گشتی تاقمێ لە دارگـەلی هاوڕەگـەزی سەوڵ.

**ســرو نــاز:** ســـەروەناز؛ داردەمـاخ؛ سەوڵـێکی ڕازێنـەیی بـە لـقوپـۆی کۆتـا و بـە شـێوەی تاجێکی باریک.

**سرو** / serv/: [فرانسوی] *اسم.* ۱. سـیرڤ؛ ڕانـانی خواردەمەنی وخواردنەوە بۆ ئامادەبوان ۲. *ـهـا/ [ورزش]* ســرویس؛ هاویـشتنی تـۆپ بـۆ وەگـەڕ خستنەوەی یاری یان درێژە پێدانی (لە یاریگەلی وەک والیبال؛ تەنیس و...).

**سرو** / sorû ، ـها/: *اسم.* ئەسـرۆ؛ ئەسـروو؛ کلـۆچ؛ شاخ؛ قۆچ؛ شەقۆل؛ قۆچی گیانـەوەر (وەک گـا و بەران و ...).

**سروان** / sarvān ، ـها/: *اسم.* سەروان؛ ئەفسەری خاوەن پلەکی سەروانی.

**ســروانی** / sarvānî/: *اسم.* ســـەروانی؛ پلـەکی چەکداری بانتر لە سوتوان یەکەمی و خوارتر لـە سەرگوردی.

**ســـروپز** / sar-o-poz/: [فارســی/ فرانـسوی] *اسم. [گفتاری]* دەق؛ دوخت؛ شـاش و پـەڕ؛ ئـارایش و پۆشەن.

**سروتراپی** / serot(e)rāpî/: [فرانسوی] *اسم.* سرۆم دەرمانی؛ کار یـا ڕەوتی دەرمـانی نەخۆشـی بـە سرۆم.

**سروته**[1] / sar-o-tah/: *اسم.* ۱. سەروبن؛ ســەروتا؛ سەروان و بنــەوان؛ ســەرەتا و بنــەتا؛ هــەوەڵ و ئاخری هەر شتێـک ‹سر و تـه تـوپ پارچـه: سـەر و بنـی تۆپی پارچە› ۲. بەر و دوا ‹سر و ته گاری: بەر و دوای عارەبانە›.

▣ **سروته یک کرباس بـودن:** *[کنایی]* لـە یـەک قوماش بـوون؛ سـەروقنگی کلاشـێک بـوون؛ جاشی ماکـەرێک بـوون؛ هـەر لـە چەشـن و

بیچمێک (زۆرتر خراپ) بوون ‹آنها هـر دو سـر و ته یک کرباسند، به هیچکدام نمی‌شود کار سپرد: هەر دووکیان لە یەک‌قوماشن، ناکرێ بە هیچیان کـار بسپێری›.

⊡ **سروته چیزی را هـم آوردن:** *[مجازی]* کردنـە دەسنوێژی خیلەڕەشیان؛ کۆکردنـەوە/ کـۆوە کردنی شـتێک؛ سـەروبنی شـتێک هێنانـەوە یـەک؛ سـەروبەری شـتێک پێکهێنـان ‹یـک جوری سر و ته صحبت را هـم آوردیـم: هـەرچۆنێک بوو کردمانە دەسنوێژی خیلەڕەشیان›.

**از سر و ته چیزی زدن:** لە کلک و گوێ شتێک دان؛ بەشـێک لـە شـتێ لابـردن یـان کورت‌کردنەوەی.

**سـروته**[2]: *قید.* پێچەوانـە؛ بـەراوەژوو؛ بـەراوەژۆ؛ بەراوەژی؛ واژۆ؛ واژی؛ سەر و تا.

⊡ **سـروته کـردن:** سـەروتاکردن؛ بـە شـێوەی پێچەوانە دەرهێنـان ‹ماشـین را سـر و تـه کـرد: ماشینەکەی سەر و تا کرد›.

**سـروته گـرفتن:** سـەرەوخوارگرتن؛ پێچەوانـە گرتن؛ بە شێوەی بەراوەژۆگرتن ‹روزنامه را سـر و ته گرفته بود: ڕۆژنامەکەی سەرەوخوار گرتبوو›.

**سـرود** / surûd, sorûd ، ـهـا/: *اسم.* سـروود: ١. خوێندنێکی کرژ و هەست بزوێن کـە زۆرتـر بە کۆمـەڵ و لـە کـۆڕێکی فەرمیـدا دەیخـوێنن ٢. مـارش؛ مووسـیقای وەهـا خوێنـدنێک ٣. هۆنراوە؛ گۆرانی؛ هەڵبەستێکی کورت کە بـۆ گۆرانی هۆنراوەتەوە.

⊡ **سرود ملی:** سـروودی نەتـەوەیی؛ سـروودێک کـە لـە لایـەن دەوڵـەتەوە بـۆ ژەنـدن لـە ڕێورەسمی فەرمیدا هەڵبژێردراوە.

⊡ **سرود یاد مستان دادن:** *[مجازی]* هەڵـخراندن؛ هەڵنانی کەسانێ بو کارێکی نالەبار.

**سـرودن** / surûdan, sorûdan/: *مـصدر. لازم.* // **سرودی:** هۆنیتەوە؛ **می سرایی:** دەهۆنیتەوە؛ **بسرا:** بهۆنـەوە// ١. هۆنینـەوە؛ شـیعر سـازکردن؛ هەڵبەست دانان؛ شیعر ڕێک خستن: **سـراییدن** ٢. *[قدیمی]* ستراندن؛ چرین؛ چڕای؛ گوتن؛ وتن؛ واتەی؛ گـۆرانی گـوتن؛ سـتران گـوتن؛ وەندەنـە؛ خوێنـدن؛ هـۆنن ٣. *[قـدیمی]* وتـن؛ گـوتن. هەروەها: **سرودنی**

■ صفت فاعلی: **سراینده** (وەهۆنەر)/ *صفت مفعولی:* **سـروده** (هـۆنراوە)/ مـصدر منفـی: **نَـسرودن** (نەهۆنینەوە)

**سروده** / surûde, sorûde ، ـها/: *اسم.* هـۆنراوە؛ هۆنیا؛ هۆنە؛ هەڵبەست؛ بەستە؛ شیعر، بەتایبەت شیعرێ کە شاعیرێکی ناسراو گوتوویەتی.

**سـرور** / sarvar ، ـان/: *اسم.* سـەروەر؛ سـەردار؛ سالار؛ سەرگەورە؛ کەسێ کە هـەمووان بـڕوایان بە سەرۆکایەتی و سەرپەرشتی هەیە.

**سرور** / surûr, sorûr/: [عربی] *اسم. [ادبی]* شایی؛ شادی؛ شادمانی؛ هەوەن؛ خۆشی.

**سرورآمیز** / surûāmîz, sorûr-/: [عربـی/ فارسـی] *صفت.* دڵخۆشـکەر؛ گوشـا؛ دڵگوشـا؛ شـادیهێن؛ هۆی شایی.

**سـرورانگیز** / surûrangîz, sorûr-/: [عربـی/ فارسی] *صفت.* شادیهێنەر؛ شادیهێن؛ دڵگوشا.

**سـرورو** / sar-o-rû/: *اسم. [گفتاری]* دەموچـاو؛ دیموچاو؛ چڕوچاو؛ دەموپل؛ سەروچاو؛ سەروروو؛ چار ‹یک مشت آب به سرروی بچه بزن: لامشتێ ئاو بدە بە دەموچاوی مندالەکەدا›.

**سروری** / sarvarî/: *اسم.* سەروەری؛ سـەرداری؛ سالاری؛ پایەبەرزی؛ مەزنایەتی؛ گـەورەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرگەورە بوون.

**سروریخت** / sar-o-rîxt/ ☜ **سرووضع**

**سـروریش** / sar-o-rîš/: *اسم. [گفتـاری]* سـەر و ریش؛ مووی سەر و دەم وچاو.

**سروزبان** / sar-o-zabān/: *اسم. [مجازی، گفتاری]* دەم وزمـان؛ دەموزوان؛ دەموپـل؛ سـەروزوان؛ گفت ولفـت؛ توانـایی قـسەکردن ‹فروشـنده باید سـروزبان داشـته باشـد: فرۆشیار دەبـێ دەموزمانـی

هەبێ›.

**سروزباندار** / sar-o-zabāndār/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* دەموزماندار؛ بە دەموزمان؛ دەموزوانـدار؛ دەموپل دار؛ سەروزواندار؛ بە توانا لە قسەکردندا ‹پـدر دامـاد خیلـی سـروزباندار بـود: بـاوکی زاوا زۆر دەموزماندار بوو›.

**سروسامان** / sar-o-sāmān/: *اسم.* سەر و سامان؛ سـامان؛ ڕێـکوپێکـی؛ تـەکوزی؛ تـەکویزی؛ مریس: **سر و صـورت**. هـەروەها: **سـر و سـامان دادن؛ سر و سامان گرفتن؛ سر و سامان یافتن**

**سروستان** / sarvestān ، ـها/: *اسم.* سەولـستان؛ سەولاوا؛ باخی سەولان.

**سروسـر** / sar-o-ser(r)/: [فارسـی/ عربـی]/*اسـم.* کـەینوبـەین؛ خلێنـە وبلێنـە؛ خـرتی وپـرتی؛ سەروساخت؛ پێوەندی نزیک و نهێنی ‹پیدا بـود که با دختر همسایه سروسری دارد: دیـار بـوو لەگـەڵ کچە دراوسێدا کەین وبەینێکیان هەیە›.

**سروش** / surûš, sorûš/: *اسـم. [ادبـی]* سـرووش: ۱. سەرۆ؛ دەنگـەژە؛ هـەواڵ و زانـستێ کـە لـە لایـەن هێزگـەلی ژوور سروشـتیەوە دەگـا ۲. جبرەئیل؛ جوبرایـل؛ فریـشتەی هەواڵـدەری خودا بۆ پێغەمبەران.

**سروشکل** / sar-o-šekl ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم. [گفتاری]* سەروڕوو؛ تمتیل؛ چەرخ وچیامان؛ تووز؛ سەروسـەکوت؛ دیمـەن؛ سـەرودیم؛ بـیچم ‹سروشـکل خـوبی داشـت: سـەروڕوویەکی جـوانی هەبوو›.

**سروصدا** / sar-o-sedā ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* هەراوهوریا؛ گرموقاڵ؛ قرموقاڵ: ۱. دەنگەدەنگ؛ همین؛ گازەگاز؛ زیپۆ؛ جووقە؛ هەست و خوست؛ دەنـگ و بـزاو؛ دەنگـی ئـازاردەری درێـژەدار و نائاسـایی ۲. هورپـەهورپ؛ هـەرا و هوریـا؛ چەقـەوگوڕە؛ شاتەشـات؛ زەنازەنـا؛ هـەراوهاوار؛ هەرا ـ هەرا؛ قوولە؛ قاوەقـاو؛ قیرەقیـڕ؛ قێڕەقێـڕ؛ وێلە؛ ویل؛ زلە؛ قـڕە؛ هۆگالـە؛ هـۆل؛ والـەوال؛ هەلا ـ هەلا؛ هەللا ـ هەللا؛ قەپ و قـاڵ و شـلۆقی بە کۆمەڵ ۳. لـەزە؛ داکۆکـە؛ حەلـەلا؛ کـەپۆرە؛ چەقەوهـەرا؛ گێلەشـۆ؛ گێلەشـۆک؛ گۆنگەشـە؛ گۆمەڵ؛ گۆڵمەز؛ زەنازەنا؛ قژین؛ قۆڕ؛ حولەسێ؛ هەرا ـ هەرا؛ چەقەوگوڕە؛ چەقەچەق؛ چێقـەچێق؛ خڕوجز؛ هەراوهۆریا؛ هەلمەلە؛ هەرمەلە؛ گێـرە و نێرە؛ گۆنگەر؛ جەنجاڵ؛ سنگەسنگ؛ سمڕ ـ سمڕ؛ سرمەسرم؛ غەلبەغەلب؛ سمڕ؛ سرمە؛ گالـەگال؛ قـسەی بـە دەنگـی بـەرز وێـڕای شـەڕ و داوای بەکۆمەڵ.

▣ **سروصدا بلند شدن:** گرم وقاڵ بەرزەوە بـوون؛ قـرموقـاڵ هەڵـسان؛ دەنگـەدەنگ هـاتن؛ هــەراوهوریا بــەرزەوە بــوون؛ زەنازەنـا دەسپێکردن ‹تا سروصدا بلنـد شـد دویـدیم تـوی کوچە: هەر گرموقاڵ بـەرزەوە بـوو هەلاتینـە نێـو کووچە›. هەروەها: **سر و صدا بودن؛ سر و صـدا شدن؛ سر و صدا کردن**

**سروصـدا خوابیـدن:** *[مجـازی]* دەنگـەدەنگ نـەمان؛ هـەرا و هوریـا خـەوتن؛ قـرم و قـاڵ کوژرانەوە.

**سروصـدا را خوابانـدن:** *[مجـازی]* بـێدەنـگ کـردن؛ قـرموقـاڵ کوژاندنـەوە؛ دەنگـەدەنگ خەواندن؛ نەهێشتنی هەراوهوریا و زەنـازەنا.

**سروصدا راه انداختن:** *[مجازی]* گرموقاڵنانەوە؛ قیل‌قاڵ کـردن؛ قریـوە/ دەنگـەدەنگ کـردن؛ سازکردنی هەراوهوریا ‹باز چە سـر و صـدایی راه انداختەاید؟: دیسانەوە چ گرموقالیکتان ناوەتەوە؟›.

**سروصورت** / sar-o-sûrat/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* ۱. دەموچاو؛ سـەرودیم؛ سـەروڕوو؛ سەروسـیما؛ چار؛ سەروچاو؛ دیمی؛ سـەروبەچک؛ دەکـودیم؛ ڕی ۲. ☜ **سر و سامان**

▣ **سر و صورت دادن:** *[مجـازی]* سـەر و سـامان دان؛ سامان دان؛ ڕێکوپێـک کـردن؛ تـەکووز کردن؛ مرێس‌کردن ‹کار مغازە را سـر و صـورت داد: کاری دووکانی سەر و سامان دا›. هـەروەها:

**سر و صورت گرفتن**

**سروصورت را صفا دادن:** *[کنایی]* لاولووسکه دان؛ لاو لووسه دان؛ تیف‌تیفه‌دان؛ خۆ جوان و لووس کردن ‹سر و صورتش را صفا داد و لباس پوشید: لاولووسکەی خۆی دا و لیباسی لە بەرکرد›.

**سروقامت / sarvqāmat:/** [فارسی/ عربی] ☜ **سروقد**

**سروقد / sarvqad:/** [فارسی/ عربی] *صفت. [مجازی]* بالابەرز؛ بەژن‌زراڤ؛ بەژن و بالا بەرز؛ بە بەرزایی و بالای ڕێک‌وپێکەوە: **سروقامت**

**سروکار / sar-o-kār:/** *اسم.* سەروکار؛ بەین؛ پێوەندی؛ نێوان ‹بهتر است با او سروکار نداشته باشی: باشترە سەروکارت لەگەڵی نەبێ›. هەروەها: **سر و کار داشتن؛ سر و کار پیدا کردن**

◘ **سروکار کسی با جایی/ کسی افتادن:** سەروکار لەگەڵ کەسێ/ شتێکدا پەیدا کردن؛ کار کەوتنە جێگە یان لای کەسێ؛ پا کەوتنە شوێنێ/ لای کەسێک: **سر کار کسی با کسی/ چیزی بودن**

**سر و کله / sar-o-kalle ،** ـها/: *اسم. [گفتاری]* سەر؛ سەروکەللە؛ سەروسەکەت؛ سەروپۆتراک؛ سەروپۆتک؛ سەروپۆتەلاک؛ سەروپۆتلاک؛ سەروپۆتراک؛ سەروپەچک؛ سەروگوێلاک؛ بانترین بەشی جەستە لە گوێ بەرەو سەر.

◘ **سروکله زدن:** *[مجازی]* دەمەـ دەمە‌کردن؛ دەمەقالی کردن؛ دمەقالی کردن؛ دەمەقرە کردن؛ پێوە ماندوو بوون؛ باس‌کردن ‹چقدر با مردم سر و کله می‌زنی: چەندە لەگەڵ خەڵکیدا دەمە‌ـ دەمە دەکەی؟›.

**سر و کله‌ی کسی پیدا شدن:** *[کنایی]* دەرکەوتنی کەسێک؛ کەسێک بێ‌خەبەر هاتن ‹یک دفعه سر و کله‌ی پدرم پیدا شد: لەپڕ بابم دەرکەوت›.

**به/ توی سروکله‌ی هم زدن:** مشت‌ومڕ کردن: ۱. سەروگوێلاک یەک شێلان؛ بەر بوونە سەروپۆتراکی یەکتر ۲. *[کنایی]* پێکەوە چەقە‌کردن؛ قڕین؛ دەمەقاڵە‌کردن؛ دم‌بەدمە کردن.

**سر و کول / sar-o-kûl ،** ـها/: *اسم. [گفتاری]* سەرکۆڵ؛ سەرشان؛ قەلاندۆش؛ قەلادووشان؛ پشتەمل.

◘ **از سروکول هم بالا رفتن:** *[کنایی]* ۱. پەڕینە پشتەمل یەکتری؛ پەڕینە کۆڵ یەکتر؛ لە بەر جمکوت یان بێ‌سەرە و بەرەیی پاڵەپەستۆی یەکتری دان ۲. هەڵتیقان؛ هەڵبەزین؛ هەڵبزۆقین؛ جرت‌وفرت‌کردن؛ کایە و هەڵس‌ونیشت کردن.

**به سروکول هم پریدن:** پەڕینە کۆڵ یەکتر؛ هەڵبەز و دابەزکردن بە سەروکۆڵی یەکتردا.

**سروگاه / sorûgāh:/** *اسم.* شوێنی هەڵتۆقینی شاخی گیانەوەر.

**سروگوش / sar-o-gûš:/** *اسم. [مجازی]* سەروگوێ؛ هێزی زەینی و هەستی ژنەوایی.

◘ **سروگوش آب دادن:** *[مجازی]* گوێ تەقاندن؛ گوێ هەڵخستن؛ گوێ تەکاندن؛ هەواڵ گرتن ‹خواستم سر و گوش آب بدهم، ببینم چه خبر است: ویستم گوێ بتەقێنم، بزانم چ باسە›.

**سر و گوش جنبیدن:** *[مجازی]* قولاب دەرهاوردن/ دەرکردن؛ چووزە دەردان؛ پەرژان و گوێ دان یان گەڕان بۆ بابەتگەلی جینسی، کۆمەلایەتی، سیاسی و وەک ئەوانە ‹آزاد هم کم‌ـکم دارد سر و گوشش می‌جنبد: ئازادیش کەم‌ـکەم خەریکە قولاب دەردێنێ›.

**سرولباس / sar-o-lebās ،** ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم. [گفتاری]* سەر و جل؛ دوخت؛ دەق؛ پەڕوپۆ؛ باری جل‌وبەرگ.

**سروم / serom:/** [فرانسوی] ☜ **سِرُم**

**سرومر / sor-o-mor:/** *صفت. [گفتاری]* زرت‌وزینەدوو؛ زرک وزینگ؛ زیکل؛ ساق و

سەلیم.

**سرووضع** / sar-o-vaz'/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* *[گفتاری]* سەکوت؛ سەکووم؛ سەکوم؛ تووز؛ سەروسیما؛ سەروقلخ؛ سەروسەکوت؛ چۆنیەتی ئارایشت و پۆشەن: **سروریخت**

**سروهمسر** / sar-o-hamsar/: *اسم.* *[گفتاری]* کەس‌وکار؛ چێرومێر؛ کریڤ؛ دۆست، ئاشنا، خزم، هاوکار و هەموو ئەوانەی هاموشۆی کەسێک دەکەن.

**سرویس** / servîs ، ـها/: [فرانسوی/ انگیسی]/*اسم.* سرویس: ١. ڕاژە؛ پەرایی؛ خزمەت؛ کار یان کارگەلێ کە زۆرتر بۆ ئاسایشی دیتران دەکرێن ‹راه‌آهن باید به مردم سرویس بدهد: ڕێئاسن دەبێ سرویس بداتە خەلکی› ٢. کار یان ڕەوتی شۆردن و وردەکاری دەزگاگەلی میکانیکی ‹ماشین را دیروز دادم سرویس کردند: دوێنێ ماشینەکەم دا سرویسیان کرد› ٣. کۆمەلە کەرەستەگەلی هاوگەر بە چالاکیەک، بەتایبەت کاری ناو مال ‹سرویس دستشویی: سرویسی دەسشۆری› ٤. کەرەستەی سەبارەت بە چەشنێ خزمەت ‹سرویس حمل و نقل: سرویسی گواستنەوە› ٥. سەعاتی کار؛ ماوەی چالاکی ڕۆژانە لە مەزرینگەدا ‹سرویس اداری: سرویسی مەزرینگەیی› ٦. *[گفتاری]* ماشێنی هات‌وچۆ پێکردنی ڕێخراوەیەک ‹سرویس کارخانه: سرویسی کارخانە› ٧. ڕێخراوەی ڕاژەیی/ خزمەتگوزاری ‹سرویس پستی: سرویسی پوستی› ٨. *[گفتاری]* کەرەسەی پاکژی ‹آپارتمانی شامل دو اتاق خواب، هال و سرویس: وارخانێک بە دوو ژوور، هال و سرویسێکەوە› ٩. *[ورزش]* کاری هاویشتنی تۆپ بۆ وەگەڕ خستنی کایە یان درێژەپێدانی.

▣ **سرویس دادن:** سرویس دان؛ پەرایی دان؛ خزمەت کردن ‹این اداره باید به مردم سرویس بدهد: ئەم مەزرینگەیە دەبێ بە خەلک سرویس بدات›. هەروەها: **سرویس خواستن؛ سرویس گرفتن**

**سرویس کردن:** سرویس‌کردن؛ چاک و ڕێک‌وپێک‌کردن ‹ماشین را سرویس کرد: ماشینەکەی سرویس کرد›.

**سرویس‌دهی** / servîsdehî/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* خزمەتکاری؛ خزمەتگوزاری؛ ڕاژەکاری؛ کار یان ڕەوتی ڕاژەدان.

**سرویسکار** / servîskār ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی]/*اسم.* سرویس‌کار؛ کاریگەری لێزان یان بەرپرسی سرویس (چاک کردنەوە، خاوێن و ڕێک‌وپێک کردن).

**سره** / sare/: *صفت.* *[ادبی]* ١. دروست؛ ڕاست ٢. چاک؛ باش؛ خاس؛ قەنج؛ بێ کەم و کووڕی ٣. پەتی؛ بێخەوش.

**سرهم بند** / sar(e)hamband/: *صفت.* *[مجازی، گفتاری]* سەرچل؛ سەرشکێن؛ سەرسەری؛ بەبێ سەرنج لە کارکردندا.

**سرهم‌بندی** / sar(e)hambandî/: *اسم.* *[مجازی، گفتاری]* سەرچلی؛ شەغلمەکاری؛ گۆترەکاری؛ کاری بەبێ لێڕوانین و ڕێک‌وپێکی.

**سرهنگ** / sarhang ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سەرهەنگ؛ ئەفسەری خاوەن پلەی سەرهەنگی.

▣ **سرهنگ دوم:** سەرهەنگ دوو؛ ئەفسەرێک بە پلەکی بانتر لە سەرگورد و خوارتر لە سەرهەنگ.

**سرهنگی** / sarhangî/: *اسم.* سەرهەنگی؛ پلەکی چەکداری بانتر لە سەرگوردی و خوارتر لە سەرتیپی.

**ـ سری** / sarî/: *پیواژە.* ـ سەری؛ پێوەندیدار بە سەرەوە ‹بالاسری؛ پشتسری: بانسەری؛ پشتەسەری›.

**سری** / serrî/: [عربی] *صفت.* پەنامەکی؛ نهێنی؛ سەنتە؛ شاردراوە لە دیتران.

**سری** / serî ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* ١. زنجیرە؛ ڕێسە؛ ڕیس؛ ڕشتە؛ ئامێر یان ڕووداوگەلی یەک

له دوو یەک لە مەبەستێک ‹برای تشکیل شرکت تعاونی، یک سری گفتگوهایی شده بود: بۆ دامەزرانی بەشدارگەی هەرەوەزی، زنجیرە وتووێژێک کرابوو›
٢. دەست؛ دەس؛ چین؛ دانەیەک لە کەلپەلی هاوجنس کە پێکەوە کۆمەڵێ پێکدێنن ‹یک سری قاشق و چنگال نقره: دەستێ کەوچک و چنگاڵی زیو›.

**سریال** / ser(i)yāl، ـها/: [فرانسوی]/اسم. سریاڵ؛ ڕێسە؛ زنجیرە؛ ئەوەی بە شێوەی بەشگەلی بە شوێن یەکدا بلاو دەبێتەوە.

**سریان** / sarayān/: [عربی]/اسم. [ادبی، نامتداول] ١. گەڕ؛ گەشت؛ کار یان ڕەوتی گەڕان ٢. ستیرمە؛ گیرۆیی؛ تەشەنە؛ تەشەنا؛ کار یان ڕەوتی تەنینەوە.

**سریانی** / soryānî/: [عربی]/اسم. سوریانی: ١. هۆزێکی سامی کە لە بەینچۆمان دەژیان ٢. /ها؛ ـان/ هەر کام لە کەسانی ئەو هۆزە ٣. لە زاراوەگەلی زمانی ئارامی کە لە سووریا و بەینچۆماندا قسەی پێ دەکرا.

**سریدن** / sorîdan/: مصدر. لازم. // **سریدی**: خزای؛ **می‌سری**: دەخزی؛ **بِسر**: بخزە///[گفتاری] خزان؛ خزین؛ خزیان؛ قەلزین؛ خلیسکان؛ هەلیسکان؛ فسکین؛ زەلین؛ دەرحەسین؛ هولیسین؛ هولسین؛ تەهسین؛ خوشکین؛ خزەی؛ خزای؛ شەمتین؛ شلەپین؛ هەڵخلیسکیان؛ هەڵخلیسکین؛ سوڕ خواردن.

■ صفت فاعلی: **سرنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **سریده** (خزاو)/ مصدر منفی: **نَسریدن** (نەخزان)

**سری‌دوز** / serîdûz، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. دەسدوور؛ دەستدروو؛ دوورینی تیکە، ئەندازە یان چەشنێکی دیاریکراوی پۆشاک لە ئەژماری زۆردا. هەروەها: **سری‌دوزی**

**سریر** / sarîr، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] تەخت؛ کەت؛ کورسی ‹سریر پادشاهی: تەختی پاشایی›.

**سریش** / sirîš, serîš/: /اسم. خوزە؛ خوژێ؛ سریش؛ سریش؛ سریشە؛ چریش؛ چریش؛ شریژ؛ شیرێژ؛ شەیژ؛ شریش؛ شریس؛ شریش؛ ئەسرێلک؛ ئەستریلک؛ ئەستریلک؛ ئەسریلک؛ زرێچ: ١. ماسریشمە؛ گیاچریش؛ گوولک؛ سترک؛ گیایەکی خورسکی بێ‌لاسک، بە گوڵی درکاوی و بنجکی ئەستوورەوە ٢. گەردێکی نەرم کە لە بنجی وشکەوەکراوی گیای سریش دەگیردرێ.

**سریشم** / sirîšom, serîšom، ـها/: /اسم. هێلم؛ ماسریشم؛ ماسریشمە؛ غەرە؛ زرێچ؛ ئەو ماکە چەسپێنانە کە لە پێشە و پەلاشی گیانەوەران یان پێستی سەری ماسی بەرهەم دێ و لە ناو ئاوی گەرمدا وەک ماکێکی چەسپۆکی لیقنی لێ دێ.

**سریع**[1] / sarî'/: [عربی] صفت. توند؛ تون؛ تن؛ گورج؛ کرژ؛ خێرا؛ زوو؛ چەسبۆ ‹جریان سریع رودخانه: ڕەوتی توندی ڕووبار›.

**سریع**[2]: قید. توند؛ تون؛ تن؛ گورج؛ کرژ؛ بە پەلە؛ بەلەز؛ بە هەشتاو؛ خێرا؛ زوو؛ چەسبۆ ‹سریع بروا!: توند برۆ!›.

**سریعاً** / sarî'an/: [عربی] قید. خێرا؛ گورج؛ گورجێ؛ کرژ؛ زوو؛ بە پەلە؛ بە هەشتاو ‹سریعاً به خانواده‌اش خبر بده!: خێرا ماڵەوەی خەبەردار کە!›.

**سریع‌الانتقال** / sarî'ol'enteqāl/: [عربی] صفت. بیرتیژ؛ بیرتێژ؛ وریا؛ ویرا؛ بە بیر؛ زیرەک؛ بزێو؛ زیت.

**سریع‌التأثیر** / sarî'otta'sîr/: [عربی] صفت. سریمە؛ زووکارتێکەر؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی زوو کارتێکردنەوە.

**سریع‌الزوال** / sarî'ozzavāl/: [عربی] صفت. گروفڕ؛ بە تایبەتمەندی زوو فەوتیانەوە.

**سریع‌السیر** / sarî'osseyr/: [عربی] صفت. خێرا؛ زەرۆپ؛ بەپا؛ خۆشڕەو ‹قطار سریع‌السیر: قەتاری خێرا›.

**سریع‌الهضم** / sarî'olhazm/: [عربی] صفت.

زووگوێر؛ زووحەل؛ زووتاو؛ بە تایبەتمەندی زوو هەرسەک بوونەوە.

**سری کار** / serîkār ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* چێ‌کەری کۆمەڵێک کەرەستە و ئامرازی وەک یەک. هەروەها: **سری‌کاری**

**سریم** / seryom/: [فرانسوی]*اسم.* سیریوم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان، بە ژمارەی ئەتومی ٥٨ و کێشی ئەتومی ١٤٠،١٢، ڕەنگی خۆڵەمێشی و چەکچخۆر، لە ئاودا دەتوێتەوە و لە هەوادا دەسووتێ و بۆ بەرهەمهێنانی ئالیازی بەردەچەخماخ و تۆری چراتۆری بەکاردێت.

**سرین** / sorîn, soreyn ، ـها/: *اسم. [ادبی]* سمت؛ سمته؛ سورین؛ سوورین؛ پاشڵ؛ لاعن؛ قالچە؛ کەماخ؛ کاماخ؛ دوپنەی؛ کولمیک؛ کلۆت؛ کلۆک؛ تەراف؛ تەڕاف؛ زۆپی ژێر ناوقەد و ژووری ڕان.

**سزا**[1] / sezā, sazā/: *اسم.* سزا؛ جزیا؛ پاداشی کار یان ئاکارێک، بەتایبەت کاری نالەبار ‹سرانجام سزای عملت را می‌بینی: دواخری سزای کارەکەت دەبینی›.

**سزا**[2]: *صفت.* شیاو؛ سزا؛ هێژا؛ شایان ‹چنین رفتاری با او سزا نبود: وەها کارێک لەگەڵیدا شیاو نەبوو›.

**سزار** / sezār ، ـها/: [فرانسوی]*اسم.* سزار؛ قەیسەر؛ نازناو و سەرناوێ کە بە ئیمپراتووڕانی ڕۆمیان دەدا.

**سزارین** / sezār(i)yan/: [فرانسوی]*اسم. [پزشکی]* سیزاریەن؛ کار و ڕەوتی بڕینی منالدانی ژنی دووگیان لە ڕێگەی برینکاری سەر سکەوە بۆ دەرهێنانی منال لە کاتێکدا کە زاوزێ ئاسایی نەبێ.

**سزاوار** / sezāvār, sazāvār/: *صفت.* هێژا؛ سزاوار؛ شایان؛ شرژاو؛ لایق؛ پێکەوتوو؛ هەژ؛ شیاوی هەبوون لە بەر کار یان ئاکارێک ‹او سزاوار این پاداش بود: هێژای وەها خەلاتێک بوو›.

**سزاواری** / sezāvārî, sazāvārî/: *اسم.* هێژایی شیاوی؛ شرژاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شیان لێهاتن؛ لێوەشانەوە؛ وەشانەوە.

**سزیم** / sezyom/: [فرانسوی]*اسم.* سیزیوم توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ٥٥ و کێشی ئەتومی ١٣٢,٩٠، نەرم و زیولام ک لە بەر هەوادا زۆر زوو ڕەش دەبێتەوە.

**سس** / ses ، ـها/: *اسم.* ترترە؛ سەراجە مێوەخۆرکە؛ مێوەخۆر؛ گورگە؛ گیاگەڵ گیایەکی مێمل بە گوڵی سپی دووچکەدار گەلاچەی کورتەوە کە لە گیای‌تر دەهاڵێ وشکی دەکا.

**سس** / sos ، ـها/: [فرانسوی]*اسم.* سوس؛ هەر کا لەو تامانەی کە بە بەهارات بۆنخۆش کراون و ب شێوەی تراوێکی خەست دەیکەنە سەر سالاد چێشتی ئامادەوە و دەیخۆن ‹سس گوجەفرنگی سس قارچ: سوسی تەماتە؛ سوسی کارگ›.

**سست** / sost/: *صفت.* سست؛ سس: ١. ک گەوش؛ شل؛ بەبێ پتەوی پێویست ‹این سقف خیلی سست است، می‌ترسم دوام نیاورد: ئەم سەرمیچ زۆر سستە، دەترسم بەرگە نەگرێ› ٢.لۆق؛ لەق ناقایم؛ خلی؛ خۆنەگر؛ ترغەل؛ شل و ول هەمین؛ شلەپەتە؛ شلەپەتێ؛ قژ؛ فش؛ فشەلۆک بێ‌پێوەندی پتەو لە نێوان بەشگەلیدا ‹رابطە سست: پێوەندی سست› ٣. خاو؛ خاو و خلیچک خاو و خلیسک؛ تەوەزەل؛ تەمەڵ؛ مەلاس مەدلمە؛ سلپ؛ تراڵ؛ تەپ؛ نەبەگە؛ لەشگران کەهال؛ کاهێل؛ شۆق؛ شل و شەوێق؛ کاسوول بێ‌تان؛ شل و شۆل؛ بێ هێزی پێویست ‹آ سست: مرۆی خاو›.

▣ **سست شدن**: سست بوونەوە؛ سس بوونەو خاوەوە بیەی: ١. داهێزان؛ داهێزران؛ ش بوون؛ خاو خلیسک بوون؛ لاواز بوون؛ شل شەوێق بوون؛ کز و بێ‌تەشە بوون ٢. *[مجازی]* دڵسارد بوونەوە؛ ناهومێد بوون؛ شل بوونەوە.

سست کردن: هەڵساندن؛ سست کردن؛ شل‌وول‌کردن؛ خاوکردنەوە؛ شل‌کردنەوە.

**سست‌اراده** / sost'erāde/: [فارسی/ عربی] *صفت*. *[مجازی]* نەبڕ؛ شلک؛ خاوەن ویستی نەگرساو.

**سست بنیاد** / sostbonyād/: *صفت*. *[ادبی]* لەق؛ ناپتەو؛ بەبێ بنەڕەتی پتەو.

**سست‌پیمان** / sostpeymān/: *صفت*. *[ادبی]* پەیمان‌شکێن؛ بێ‌بەڵێن؛ بێ‌بەینەت؛ سس‌پەیمان؛ بێ‌شەرت و بەقا.

**سست‌رأی** / sostra'î/: [فارسی/ عربی] *صفت*. *[مجازی]* دەمدەمی؛ حولحولی؛ عەنتەرمەزاج؛ بێ پێداگری و وزەی وەستان لە سەر بیر و باوەڕ و ڕای خۆ.

**سست‌عنصر** / sost'onsor/: [فارسی/ عربی] *صفت*. *[مجازی]* وازوازی؛ بەبێ ویست و گەدی پتەو.

**سست‌عهد** / sost'ahd/: [فارسی/ عربی] *صفت*. *[مجازی]* بێ‌بەڵێن؛ پەیمان‌شکێن؛ بێ‌بەخت.

**سستی** / sostî/: *اسم*. سستی؛ سسی: ١. شلی؛ شولی؛ تەپی؛ خاویلکەیی دۆخ یان چۆنیەتی تەیرین؛ مرتین؛ سست بوون ٢. *ـها/ [مجازی]* گرۆ؛ کەتوەری؛ خوێریەتی؛ لەش‌گرانی؛ شل‌وشەویقی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تەوەزەلی کردن و خۆ لە کار دزینەوە ‹چرا این‌قدر سستی می‌کنی؟: بۆ هێندە سستی دەکەی؟›.

**سسک** / sesk ، ـها/: *اسم*. فڕنەگولە؛ فیستەگولە؛ فیڕنەگولە؛ پەلەوەری چکۆلەی ئاوازخوێنی وەک قەناری بە دەندووکی باریکەوە، کە پەڕ و باڵی زوو ڕەنگ دەگۆڕێ.

**سشوار** / seš(o)vār ، ـها/: [فرانسوی] *اسم*. سیشوار؛ ئامێرێکی کارەبایی کە بە سازکردنی بای گەرم، قژ وشک دەکاتەوە.

**سطاخیس** / satāxîs/: [؟] *اسم*. گیابرین؛ گیادایکە؛ دەوەنێکە گوڵی بۆنخۆش دەگرێ، شیر زۆر دەکا و بەهێزکەرە.

**سطاره** / sattāre/: [عربی] *اسم*. *[قدیمی]* کاغەزبڕ؛ شریتەکانزایەکی لووس و بەرز و باریک، بۆ بڕینی کاغەز بە کار دەهات.

**سطح** / sath ، ـها؛ سطوح/: [عربی] *اسم*. ١. ڕووپەڕ؛ ڕووبەر؛ بەر؛ ڕووکار؛ ڕوو؛ سەلەندە؛ بەشی ئاسۆیی هەر شتێ یا شوێنێ ‹سطح آب؛ سطح میز: ڕووپەڕی ئاو؛ ڕووپەڕی مێز› ٢. ڕووکار؛ ڕووبەر؛ بەر؛ ڕووپەڕ؛ دەرەکی‌ترین سنووری هەر ماکێک ‹سطح زمین: ڕووکاری زەوین› ٣. ئاست؛ سنووری سەرووی هەر شتێ ‹سطح درامد؛ سطح زندگی: ئاستی داهات؛ ئاستی ژیان› ٤. *[ریاضی]* پانایی؛ هەرایی؛ هەراوی؛ بەراوی؛ شوێنێ کە تێدا درێژی و پانی هەیە.

▣ **سطح آزاد آب** ☜ **سطح ایستایی**

**سطح دریا**: بەری زەری؛ ڕووبەری ئاوی ئۆقیانووس کە بە دەسپێکی بەرزایی دەناسرێ و لە نەبوونی هۆکارگەلی دەرەکیدا لە هەموو ئۆقیانووس و دەریاکاندا یەکسانە.

**سطح زندگی**: ئاستی ژیان؛ ئەندازەی داهات و دەسکەوتی هەمەلایەنەی کەس، بنەماڵە یان کۆمەڵێک.

**سطحی** / sathî/: [عربی] *صفت*. ١. ڕووپەڕی؛ ڕووکاری؛ ڕوویی ‹آبهای سطحی: ئاوگەلی ڕووپەڕی› ٢. *[مجازی]* سەرسەری؛ گۆترمەیی؛ بەبێ ورد بوونەوە و چوونە ناخەوە ‹مطالعەی سرسری: خوێندنەوەی سەرسەری› ٣. *[مجازی]* سەرپۆت؛ بەبێ توانای تێفکرین و ورد کردنەوە ‹آدم سطحی: مرۆی سەرپۆت›.

**سطحی‌نگر** / sathînegar/: [عربی/ فارسی] *صفت*. سەرسەری؛ بێ‌بینشت و هەڵسەنگاندنی ورد.

**سطر** / satr ، ـها؛ سطور/: [عربی] *اسم*. دێڕ؛ ڕیز؛ خەت؛ ڕزنێکی ئاسۆیی لە نووسراوە ‹هر سطر از این نوشته دارای حدود شش واژه است: هەر دێڕ لەم نووسراوە نزیک بە شەش وشەیە›.

**سطل** / satl ، ـها/: [عربی] *اسم*. سەتڵ؛ سەتلە؛ ساتڵ؛ ستڵ؛ سیتل؛ دۆڵ؛ دۆلە؛ باڵدی؛ پەقرەج؛

ئـەلپ؛ دەفرێکـی زۆرتـر گرۆڤـەری قـووڵ و دەسـکدار بـۆ هەڵـگرتن و گوێزانـەوەی شـت، بەتایبەت تراو.

▣ سطل آشغال/ زبالـه: سەتـڵی زبـڵ؛ زبـڵدان؛ دەفری زبڵ تێکردن ‹همه را پاره کرد و ریخت توی سطل آشغال: هـەمووی دڕانـد و خـستیە نێـو سەتڵی زبڵەوە›.

**سطلی**[1] / satlî/: [عربی] صفت. سەتـڵی؛ دۆڵـی؛ ناوسەتڵ؛ بە سەتڵ یان بە بەسـتەبەندی وەکـوو سەتڵ ‹ماست سطلی ارزانتـر اسـت: ماسـتی سەتـڵی هەرزانترە›.

**سطلی**[2]: قید. ۱. سەتـڵیێ؛ هـەر پـەقرەج ‹سطلی پانـصد تومـان اسـت: سەتـڵێ پانـسەد تمـەن› ۲. سەتڵی؛ لە نێو سەتڵ ‹آب را سطلی می‌فروختند: ئاویان سەتڵی دەفرۆشت›.

**سطوت** / satvat/: [عربی]/اسم. /ادبی/ سام؛ سامی؛ هەیبەت؛ حەیبەت؛ ڕاسەر؛ بەرزی و هێـزێ کـە ترس و ڕێزی بینەر دەبزوێنێ.

**سطوح** / sutûh, sotûh/: [عربی] جمعِ ☜ **سَطح**

**سطور** / sutûr, sotûr/: [عربی] جمعِ ☜ **سَطر**

**سـعادت** / sa'ādat/: [عربـی]/اسـم. خۆشـبەختی؛ وەشبەختی؛ بەختەوەری؛ بەختیاری؛ کامەرانی؛ بەهاتی؛ فەڕ و فێت.

▣ **سعادت داشتن**: خۆشبەخت بوون؛ وەشبەخت بیەی؛ بەختەوەر بوون؛ بەختیار بوون.

**سعادت یافتن**: خۆشـبەخت بـوون؛ بەختـەوەر بیەی. هەروەها: **سعادت پیدا کردن**

**سعادتمند** / sa'ādatmand/: [عربی/ فارسی] صفت. بەختەوەر؛ خۆشـبەخت؛ وەشـبەخت؛ بـەختیار؛ بەبەخت؛ کامێران؛ کامران؛ کامەران؛ بەهات.

**سـعایت** / sa'āyat ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. /ادبـی/ ۱. سیخوڕی؛ دووزمـانی؛ بـەزاخی؛ دۆقلمـەری؛ شۆفاری؛ شـووفاری؛ قـسەبەری ۲. خراپـەبێژی؛ گالەگورت؛ کورت و پست؛ پاشەملە؛ خراپە وتنی کەسێک لە پشتەسەری. هەروەها: **سعایت کردن**

**سـعتر** / sa'tar/: [عربـی]/اسـم. جـاترە؛ کـاکوتی؛ گیادانووێ؛ گیایێ بۆنخۆش بە گوڵی سـپی ئامـاڵ پەمەییەوە کە بۆ مەبەستی بژیشکی و بەهارات و گرتنی بۆنخۆشی بەکاردێ.

**سعد** / sa'd/: [عربی] صفت. /ادبی/ پیرۆز؛ هـەزەخ؛ مبـارەک؛ هومـایۆن ‹سـتارەی سـعد: ئەسـتێرەی پیروز›.

**سعد** / so'd/: [عربی]/اسم. /ادبـی/ سـۆتکە؛ سمـڵ؛ سمڵی؛ سملە؛ سیاوسەدە؛ گیایەکی گـەڵاباریک لە تیرەی دەغڵ و دان بە سەلکی بچووکی ڕەش و بۆنخۆشەوە، دەکرێتە دەرمان بۆ بـەهێزکردنی پووک، هـەروەها بـۆ ملوانکـە کـونی دەکـەن و دەیهۆننەوە.

**سعفص** / sa'fas/: [عربی]/اسم. نێـوی پێنجـەمین دەستەی پیتی ئەبجەد، بـریتی لـە «س»، «ع»، «ف» و «ص».

**سعه ی صدر** / se'eyesadr/: [عربی]/اسم. /مجازی/ دڵفـراوانی؛ سـینگ فـراوانی؛ بـێهنفرەهـی؛ بینفرەهی؛ توانایی هەڵـکردن لەگـەڵ ڕووداو و دۆخی ناخۆشدا ‹همسایه‌ها خیلی سعه‌ی صدر داشتند که سر و صدای ما را تحمل کردند: دراوسـێکان گـەلێ دڵفراوانیان هەبوو لەگەڵ قرموقاڵی ئێمەدا ڕاهاتن›.

**سعی** / sa'î ، مساعی/: [عربی]/اسم. تـەقالا؛ هـەوڵ؛ کۆشـشت؛ کۆشـش؛ تەپـشت؛ کردوکـۆش؛ کردوکـاش؛ کـەفتولـەفت؛ شـەرک؛ کۆشـەوە؛ خەبات؛ کۆشە.

▣ سعی بلیغ: /ادبی/ خـەباتی بـێ پـشوو؛ کـاری بەبڕشـت؛ هەوڵـی یـەکجاری؛ کەفتەلـەفت؛ تەقالای هەمەلایەنە و بـێکەمایەسـی: **جهد بلیغ**

▣ **سعی داشتن**: تێکۆشان؛ تێکۆشـین؛ کۆشـین؛ کۆششت کردن؛ هەوڵدان؛ تـەقالا دان ‹سعی داشت ما را قانع کند: تیدەکۆشا ئێمە ڕازی بکا›.

سعی شدن: هەوڵ دران؛ کۆششت کران؛ تەقالا دران ‹سعی شده بود خانه زودتر آماده شود: هـەوڵ

درابوو ماڵەکە زووتر پێ بگا›.
سعی کردن: تێکۆشان؛ تێکۆشین؛ کۆشان؛ هەوڵدان ‹سعی کن زودتر کارت را تمام کنی: تێکوشە کارەکەت زوو تەواو کەی›.
**سعید** / sa'îd/: [عربی] *صفت. [ادبی]* هەزەخ؛ پیرۆز؛ بە ودم؛ ممبارەک؛ موبارەک؛ مارەک؛ هومایۆن؛ مارک.
**سغدی** / soqdî/: *اسم.* سوغدی؛ لقێک لە زمانگەلی هیندو- ئیرانی، کە لە کۆندا لە ئاسیای ناوەندی (سوغد) قسەی پێ دەکرا.
**سغر** / soqor, soqar/: [از کردی] *اسم. [قدیمی]* سیخور؛ سیخچوولە؛ سووچەڕ؛ سیچڕ؛ سووچ؛ گیانەوەری لە تیرەی ژووژک و هێندێک گەورەتر.
**سفائن** / safā'en/: [عربی] ☜ **سفاین**
**سفارت** / sefāret, safārat/: [عربی] *اسم.* ١. باڵوێزی؛ ڕاسپاردەیی؛ سەفیری؛ باڵیۆزی؛ کار و پیشەی باڵوێز ٢. *ـها/ [گفتاری]* باڵوێزخانە.
▣ به سفارت رفتن: ١. بوونە باڵوێز ٢. *[گفتاری]* چوونە باڵوێزخانە؛ بۆ باڵوێزخانە چوون.
**سفارتخانه** / sefāratxāne, safāratxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* باڵوێزخانە؛ خانووبەرە یان نووسینگەیەک کە باڵوێزی وڵاتێکی بیانی و هاوکارانی تێیدا ئەرکی فەرمییان بەجێ دێنن.
**سفارش** / sefāreš ، ـها؛ ـات/: *اسم.* داخوازی؛ داوخوازی: ١. لەمەلەم؛ سپارەیی؛ سپاردەیی؛ سفارشت؛ ڕاسپێری؛ قەوینتی ٢. *[اقتصاد]* داوای بەرهەم هێنان یان ناردنی کاڵا.
▣ سفارش دادن: ڕادان؛ ڕاسپاردن؛ کەلوپەل خواستن.
سفارش کردن: ڕاسپاردن؛ سەختی کردن؛ قەوینتی کردن.
سفارش کسی را کردن: خوازیاری جێبەجێ کردنی کاری کەسێک بوون.
**سفارش‌دهنده** / sefārešdahande ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* ڕاسپێر؛ سفارشدەر؛ ئەوەی خوازیاری بەرهەم هێنان یان کڕینی کەلوپەلە.
**سفارش‌گیرنده** / sefārešgîrande ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* ئەوەی بەرهەم هێنان یان فرۆشتنی کەلوپەلێکی لێ خوازراوە.
**سفارشی** / sefārešî ، ـها/: *صفت.* ڕاسپێراو: ١. پێسپێراو ‹نامەی سفارشی: نامەی ڕاسپێراو› ٢. ڕاسپاردە ‹مشتری سفارشی: موشتەری ڕاسپێراو› ٣. ڕاسپاردوو؛ داواکراو؛ خوازراو ‹کتابهای سفارشی را آوردیم: کتێبە ڕاسپێراوەکانمان هێنا› ٤. *[مجازی]* تایبەت؛ زۆر باش ‹این کفشها سفارشی است: ئەم پێڵاوانە تایبەتن›.
**سفاک** / saffāk ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت. [ادبی]* خوێنڕێژ؛ بێڕەحم؛ بێبەزەیی؛ بێبەزە. هەروەها: **سفّاکی**
**سفال** / sofāl ، ـها/: *اسم.* ١. سوال؛ سواڵەت؛ کریچ؛ ئەشکەو؛ هەرگینە؛ قوری؛ کاشوول؛ ئێربار؛ بەرهەمێ کە لە گڵی هەوڕگەری دەیپێژن ٢. توێکڵی پستە، بادام، فندق و ... کە زوور و قورنج- قورنج بن.
**سفال‌سازی** / sofālsāzî/ ☜ **سفالگری**
**سفالگر** / sofālgar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* هەوڕگەر؛ ئێربارگەر؛ کاسەکەر؛ ئێر بارکەر؛ گۆسکەر؛ پیرۆت؛ گۆزەکەر؛ قەواق؛ کەسێ کە دەفری سواڵەت چێ دەکا.
**سفالگری** / sofālgarî ، ـها/: *اسم.* هەوڕگەری؛ کاسەکەری؛ قەواقی؛ گۆزەکەری: ١. کار و هونەری سواڵەت دروست کردن ٢. کارگەی دروست کردنی سواڵەت ❋ **سفال‌سازی**
**سفالی** / sofālî ، ـها/: *صفت.* سواڵەتی؛ سواڵەت؛ گڵین؛ گلێنە؛ لە گڵ چێکراو ‹کوزەی سفالی: گۆزەی سواڵەتی›.
**سفالین** / sofālîn ، ـها/: *صفت. [ادبی]* سواڵەتی؛ کریچی؛ گڵین؛ گڵێنە؛ سواڵەت؛ لە قوڕ دروستکراو.

**سفالینه** / sofālîne ، ـها/: *اسم.* گـلینه؛ هەڕگینـه؛ قافلۆک؛ هوود؛ درووستکراو له سواڵەت.

**سفاهت** / sefāhat, safāhat/: [عربی] *اسم. [ادبی]* گەوجی؛ نەزانی؛ بێئاوەزی؛ بێئەقـڵی؛ نـەفامی ‹این کار منتهای سفاهت است: ئـەم کـارە ئـەو پـەڕی گەوجیە›.

**سفاین** / safāyen/: [عربی] جمـعِ ☜ **سَـفینه: سفائن**

**سـفت** / seft/: *صـفت. [گفتـاری]* سـفت؛ سـف؛ سفتوسـۆڵ؛ سـخ: ١. پتـەو؛ پـەیت؛ ئەسـتەم؛ هـێقم؛ ڕەپ؛ پـڕپۆ؛ زۆپ؛ زت؛ سـەخت؛ گـوژم؛ زوها؛ زوا؛ سرت؛ ڕەق؛ ڕچ. بەرانبـەر: **نرم** ‹چـوب سـفت: داری سـفت› ٢. ڕاوەسـتاو؛ پتـەو؛ قـایم؛ خۆگرتوو ‹سفت بایست: سـفت ڕاوەسـتە› ٣. ڕەق؛ پنر؛ کزر؛ وشک؛ کڕ؛ پندر؛ پند؛ زوا؛ زوهـا؛ ڕەق و بێئاو ‹خوراک سفت: خۆراکی سفت›. هـەروەها: **سفت بودن؛ سفت شدن؛ سفت کردن**

**سـفت** / soft/: *اسـم.* ١. *[گیـاەشناسـی]* ڕێگـە باریکەیـەک لـە سـەرووی هێلکۆکـەوە کـە لـە دانەگەلی پێگەیـشتوودا بـە شـێوازی کونـێ لـە توێکڵی دانەوە دیارە و توخم لە سەرەتـای ڕوانی دانە لەوێوە تێدەپەڕێ ٢. *[جانورشناسی]* کونێ لـە نێو هێلکۆکەی برێک لە مـیرووان کـە سـپێرمی لێ دەبوێری و تۆم پێک دێنێ ٣. *[ادبی]* کونیلـە؛ سۆ؛ کونی گچکە.

**سفت کاری** / seftkārî/: *اسم.* سفتکاری؛ بەشێ لە ڕەوتی ماڵکردنەوە بریتی لە کـاری بنـەڕەت دانان، دیوار هەڵچنین و گرتنی میچـی خـانوو. بەرانبەر: **نازککاری**

**سفتن** / softan/: *مصدر. متعـدی. [ادبی]* // **سـفتی**: سمیـت؛ ـــ ؛ــ// سمـین؛ سمـتین؛ سمـتن؛ سمتاندن؛ سماندن؛ سمـەی؛ سمـای؛ سـۆنتن؛ نـۆژین؛ نـووژین؛ نـوهتن؛ قوقـڵین؛ قۆقلانـدن؛ قـولی/ قـولێزکردن؛ کونـاکردن؛ وڵـەکەردەی؛ قولکردن؛ کونکردن.

■ صـفت مفعـولی: **سـفته** (سمـاو) / مـصدر منفـی: **نسفتن** (نەسمین)

**سفته** / safte ، ـها/: *اسم.* سفتە؛ پسوولەی حەواڵە؛ بەڵگەیێ کـە بـە پێـی ئـەوە کەسـێ دانـەوەی پارەیـێ لـە وادەیـەکی دیـاریکراودا وە ئەسـتۆ دەگرێ.

⊡ **سفته امضا کردن**: سفتە ئیمزاکردن؛ بە ئیمـزا کـردنی سـفتە، دانـەوەی پارەیـێ وە ئەسـتۆ گرتن. هەروەها: **سفته دادن**

**سـفته گـرفتن**: سـفتەگرتن؛ بـە وەرگـرتنی سـفتەی ئیمزاکـراوی کەسـێ، ئـەو کەسـە پێبەندی دانەوەی دراوێ کردن.

**سفتەبـازی** / saftebāzî ، ـها/: *اسم.* ١. کـڕینی پەڕەگەلی بایەخدار بـۆ هەڵکێـشانی نرخیـان و فرۆشـتنیان لـەپاش گـران بـوون ٢. کـڕینی شـتومـەک بـە سـفتە و فرۆشـتنی بـە پـارە ٣. کڕینی شتومەک لە قەبارەیێکی زۆردا بەبێ پارە و لە ڕێگەی بەڵگە و سفتەوە.

**سـفت و سـخت** / seft-o-saxt/: *قیـد. [گفتـاری]* سفت و سۆڵ؛ ڕەق و پتەو؛ توند و پتەو؛ قورس و قایم؛ زۆر بە ڕاستی و بە پێداگریەوە.

**سـفتی** / seftî/: *اسم.* سـفتی؛ ڕەقـی؛ پتـەوی؛ سەختی؛ توندی؛ قایمی.

**سـفچ** / safč/: *اسـم. [قـدیمی]* خـرچ؛ خرچـە؛ قەرەخرچە؛ بەچکە گندۆرە؛ عەنجووڕ؛ کاڵەکەی نەگەیشتوو و زرک.

**سفر** / safar ، ـها: أسفار *[نامتداول]*/: [عربـی] *اسم.* سەفەر؛ یۆم: ١. ئۆغر؛ کار یان ڕەوتی لە شار یان وڵاتێکەوە بۆ شار یان وڵاتێکیتر ڕۆیشتن ٢. کار و ڕەوتی ڕۆیشتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتـر بە ئامێری گواستنەوە ‹سفر درونشهری: سـەفەری نێوشاری› ٣. جێگایەک دوور لە ماڵ یان شوێنی نیشتەجێ بوون. بەرانبـەر: **حَضَر** ‹بـە سفر رفتن: چوونە سەفەر›

⊡ **سـفر آخـرت**: *[مجـازی]* دواهـەوار؛ دواکـۆچ؛

کۆچی دوایی؛ مەرگ.
**سفر بخیر:** سەفەر بە سەلامەت؛ سەفەر خۆش؛ سەفەر بێخەتەر؛ ئۆغر بە خێر؛ یۆم بخێر (لە کاتی خواحافیزیدا بە مسافری دەڵێن).
**سفر فضایی:** گەشتی ئاسمانی.
**سفر قندهار:** *[تعریض]* سەفەری دوور و درێژ.
▣ **سفر کردن:** سەفەرکردن؛ بۆ سەفەر چوون.
**از سفر آمدن:** لە سەفەر هاتنەوە؛ گەڕانەوە لە سەفەر.
**سِـفر** / sefr ، اسفار/: [عربی] *اسم. [نامتداول]* ١. کتێب؛ پەرتووک ‹سفر پنجم: کتێبی پێنجەم› ٢. هەر یەکە لە پێنج بەشی تەورات.
**سفرا** / sofarā/: [عربی] جمعِ ☜ **سَفیر**
**سفرنامه** / safarnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* سەفەرنامە؛ نووسراوەیێ کە ڕووداو یان بەسەرهاتی سەفەری تێدا نووسراوە ‹سفرنامەی ریچ به کوردستان: سەفەرنامەی ڕیچ بۆ کوردستان›.
**سفره** / sofre ، ـها/: *اسم.* ١. سفرە؛ سەخردان؛ خوان؛ تۆشەبەرە؛ تفال؛ کەوڵ ‹ببر سفره را پهن کن!: سفرەکە بەرە دایخە!› ٢. *[مجازی]* ئەوەی لە سەر سفرە دادەنرێ ‹سفرەی رنگین: سفرەی ڕەنگاوڕەنگ› ٣. جۆرێ ڕێوڕەسمی ئایینی ‹سفرەی نذری: سفرەی نەزر و نیاز› ٤. *[زمین‌شناسی]* توێژێکی پان و بەرین لە ماکی کانی یان ژێرزەوینی کە ناوچەیێکی داپۆشیوە و ئەستووریەکەی لە پانیەکەی کەمترە.
▣ **سفرەی رنگین:** سفرەی ڕازاوە؛ سفرەی ڕەنگاوڕەنگ؛ سفرەی ڕەنگین.
**سفرەی عقد:** سفرەی مارە بڕان؛ سفرەیێ کە لە پێش بووک و زاوادا ڕایدەخەن و ئاوێنە و شەمدان و قورئان و بڕێ خواردەمەنی کە زۆرتر نمانان لە سەری دادەنێن.
**سفرەی نذری:** سفرەی نەزر و نیاز.
**سفرەی هفت‌سین** ☜ **هفت‌سین**
▣ **سفره انداختن:** سفرە ڕاخستن/ داخستن؛ خوان ڕاخستن؛ کەوڵ پان کردنەوە؛ سفرەڕە یاوەی؛ سفرە یاوایرە؛ سفرە بڵاوکردنەوە.
**سفره چیدن:** سفرە چنین؛ خوان چنین.
**سفرەی دل خود را پیش کسی باز/ پهن کردن:** *[مجازی]* نهێنی خۆ لای کەسێ درکاندن؛ سفرەی دڵی خۆ بۆ کەسێ کردنەوە.
**سفره کردن:** *[کنایی]* هەڵدڕین؛ دڕین؛ دادڕین؛ هۆردڕیەی ‹شکم کسی را سفره کردن: زکی کەسێک هەڵدڕین›.
**سـفره‌آرایی** / sofre'ārāyî ، ـها/: *اسم.* سفرەڕازێنی؛ کار، ڕەوت یان هونەری ڕازاندنەوەی سفرە و خوان.
**سفره‌خانه** / sofrexāne ، ـها/: *اسم. [قدیمی]* دیواخان؛ دیوی خوان؛ دیوەخوان؛ دیوی نان خواردن.
**سفره‌ماهی** / sofremāhî ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ماسی کارتووخک؛ سفرەماسی؛ جۆرێک ماسیە بە لەشی پان و تەختەوە.
**سفری** / safarî/: [عربی] *صفت.* سەفەری: ١. بە کەڵک بۆ سەفەر ‹لباس سفری: جلوبەرگی سەفەری› ٢. *[گفتاری]* لە سەر سەفەر ‹ما هم سفری شدیم: ئێمەیش لە سەر سەفەرەین› ٣. *[ادبی]* سەفەرکردوو یان لە ناو سەفەردا ‹یار سفری: یاری سەفەری›.
**سفسطه** / safsate ، ـها/: [معرب از یونانی] *اسم.* شاشوێژی؛ هەڵەوێژی؛ شاش و بێش؛ شاش و وێش: ١. وتووێژی بەبێ بەڵگەی ڕاستەقینە و لە سەر گومان ٢. بەڵگە هێنانەوەی هەڵە.
هەروەها: **سفسطه کردن**
**سفلا** / soflā/: [عربی] *صفت.* خواروو؛ خوارگ؛ خوارین؛ وارین ‹زاغەی سفلی: زاخەی خواروو›: **سفلی**
**سفلگی** / soflegî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* سپڵەیی؛ پێنەزانی؛ پەستی؛ پەسپندەیی؛ پەسپەندەیی؛

بێ‌فەڕی.

**سفله** / sofle ، ـها؛ ـگان/: [عربی] *صفت. [ادبی]* سپڵە؛ پێنەزان؛ پەست؛ پەس؛ پەسپندە؛ پەسپەندە؛ بێ‌فەڕ؛ گوورنەبەش؛ هۆڤەبەر؛ تخڵ؛ بێ بایەخ و بێوەری لە ئاکاری شیاو.

**سفله پرور** / sofleparvar/: [عربی/ فارسی] *صفت. [ادبی]* سپڵەپەروەر؛ پەروەرێنەری مرۆی پەست و پێنەزان.

**سفله نواز** / soflenavāz/: [عربی/ فارسی] *صفت. [ادبی]* سپڵەپەروەر.

**سفلی** / soflā/: [عربی] ☜ **سُفلا**

**سفلیس** / seflîs/: [فرانسوی] ☜ **سیفیلیس**

**سفها** / sofahā/: [عربی] جمعِ ☜ **سَفیه**

**سفید** [1] / sefîd, sifîd/: *اسم.* سپی: ١. چەرمگ؛ ئسبی؛ چەرموو؛ چەرمە؛ چۆڕ؛ ئسپیە؛ سپی؛ ڕەنگی بەفر یان شیری تازە. هەروەها: **سفیدرنگ** ٢. *[موسیقی]* یەکەی کات لە نۆت نووسیندا کە درێژیەکەی نیوەی «گرد»یکە.

▣ **سفید یخچالی**: ڕەنگی شیری.

**سفید** [2]: *صفت.* ١. سپی؛ ئسبی؛ ئسپیە؛ چەرمگ؛ گەور؛ سفی؛ چەرمە؛ چەرموو؛ کەشک؛ بە ڕەنگی سپی ‹پارچەی سفید: پارچەی سپی› ٢. سپی‌بۆز؛ ڕەنگی خۆڵەمێشی کەم ڕەنگ ‹موی سفید: قژی سپی› ٣. نەنووسراو؛ چەرموو؛ بێ نەخش و نیگار ‹کاغذ سفید: کاغەزی سپی›.

**سفید ـ** [3]: *پیشواژە.* ـ سپی؛ ـ چەرمگ؛ ـ چەرموو؛ ـ چەرمە ‹سفیدمو: مووسپی›.

**سفیدآل** / sefîd'āl ، ـها/: *اسم.* دارچکێکی لێرەواری بە ساقەتەی چوارگۆشە و گەڵای کورکداری هێلکەییەوە.

**سفیداب** / sefîdāb/: *اسم.* ١. گلەسپی؛ گڵ‌سپی؛ گڵ‌سفی؛ گەردێکی سپی لە کەربوناتی سرپ و ڕۆح یان قەڵا کە بۆ سپی‌کردنەوەی دیوار بە کەڵک دێ ٢. سپیاو؛ دەرمانی دەموچاو سپی کردن بۆ خۆ ڕازێنی؛ هەواڵی سووراو ٣. *[گفتاری]* نیمەشۆرە؛ دیمەشۆرە؛ ماکێکی خاوێنکەرەوەی کۆن بۆ شۆردنی لەش لە گڵەسپی و ماکی ئاژەڵی.

**سفیدار** / sefîdār/ ☜ **سپیدار**

**سفیدامضا** / sefîd'emzā/: [فارسی/ عربی] *اسم.* سپی واژۆ؛ لاپەڕەیەکی نەنووسراو و واژۆکراو کە بە کەسێکی‌تری دەدەن تا هەر چی دەیهەوێ بە ناوی خاوەن واژۆوە بینووسێ ‹چک سفیدامضا: چەکی سپی‌واژۆ›: **سفیدمهر**

**سفیدبخت** / sefîdbaxt/: *صفت. [مجازی]* بەختەوەر؛ خۆشنگین؛ خودانبەخت؛ خاوەن ژیانی خۆشی ژن و مێردایەتی (لەمەڕ ژنانەوە بە کار دەڕوا). بەرانبەر: **سیاه‌بخت**

**سفیدپزی** / sefîdpazî ، ـها/: *اسم.* نانەواخانەیێ کە بە ئاردی سپی نان دەکەن.

**سفیدپوست** [1] / sefîdpûst ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سپی‌پێست؛ خەڵکی سپی‌پێست؛ یەکێ لە چوار گرۆی گەورەی خەڵکی دنیا.

**سفیدپوست** [2] / sefîdpûst ، ـها؛ ـان/: *صفت.* سپی‌پێست؛ پێوەندیدار یان بەندیوار بە یەکێ لە چوار گرۆی گەورەی ڕەگەزی مرۆ کە پێستیان سپی‌کارە (لە سپی شیریەوە تا سەوزەی تاڵ).

**سفیدپوش** / sefîdpûš/: *صفت.* سپی‌پۆش؛ خاوەن پۆشەنی بە ڕەنگی سپی.

**سفیدچشم** / sefîdčešm/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* چاف‌هیشک؛ بێ‌چاوڕوو؛ چاوتوند؛ چاوقایم؛ بێ‌شەرم.

**سفیدرگ** / sefîdrag ، ـها/: *اسم.* رگ لنفی ☜ **رگ**

**سفیدرو** / sefîdrû/: *صفت.* ١. ڕوومەت چەرموو؛ دەم و چاو سپی؛ بە دەموچاوی سپی ٢. *[کنایی]* ڕووسپی؛ ڕووچەرمگ؛ ڕووچەرموو؛ ڕووسوور؛ سەربەرز.

**سفیدشویی** / sefîdšûyî ، ـها/: *اسم.* سپی‌شۆری؛ کاری لەکە و پەڵە سڕینەوە و شۆردنی

جل‌وبەرگی سپی.

**سفیدک** / sefîdak ، ـها/: اسم. [گیاه‌شناسی] دوەک؛ دۆک؛ دۆوک؛ دۆکە؛ دەوکە؛ کیفکۆ؛ گەچیرە؛ چەرمەیی؛ شۆکە؛ جۆرێ نەخۆشینی کارگی گوڵ و گیایە کە سەرەتا لە سەر گەڵا وەکوو چەند پەڵەی سپی بچووک دەردەکەوێ و پاشان لە بەرێکەوە هەموو گەڵا و بڕێ جار لاسکەکانیش دادەگرێ.

**سفیدکاری** / sefîdkārî/: اسم. سپی کاری؛ کار یان ڕەوتی گەورانەدن؛ چەرمووکردنەوە؛ چەرمەوەکەردەی؛ سپی‌کردنەوەی خانوو.

**سفیدگر** / sefîdgar ، ـها؛ ـان/: اسم. مزگەر؛ مسگەر؛ کەسێ کە دەفر و ئامانی مسی بە ساوینی قەڵایی سپی دەکاتەوە.

**سفیدگری** / sefîdgarî ، ـها/: اسم. مزگەری؛ کاری ساوینەوەی قەڵایی تەواوە بەسەر ئاوانی مسیدا بۆ بەرگری لە ژەنگ‌هێنان.

**سفیدمو** / sefîdmû/: صفت. مووسپی؛ مووچەرموو؛ مووچەرمگ: **مووسفید**

**سفیدمهر** / sefîdmohr/ ☜ **سفیدامضا**

**سفیده** / sefîde ، ـها/: اسم. ١. سپێنە؛ چەرمێنە؛ سپیلکی هێلکە؛ تراوی لینج و سپی ژێر توێکڵی هێلکەی باڵندە ٢. [گفتاری] سپێدە؛ سەوگر؛ بوولێڵەی بەیان.

◘ **سفیده زدن**: [گفتاری] سپێدە داهاتن؛ ڕۆژ بوونەوە؛ بەیان ئەنگوتن.

**سفیدی** / sefîdî ، ـها/: اسم. چەرمگی؛ سپیەتی؛ سپیاتی؛ سپیایی؛ سپێتی؛ گەوری؛ دۆخ و چۆنیەتی سپی بوون.

◘ **سفیدی چشم**: چەرمگی چاو؛ چەرموویی چاو؛ سپیایی چاو؛ بەزی چاو؛ سپێنەی چاو؛ چەرمەو چەما؛ پەردەیەکی سپی ڕۆشن کە دەورندەوری گلێنەی چاوی داگرتووە.

**سفیر** / safîr ، ـها؛ ـان؛ سُفَرا/: [عربی] اسم. باڵیوز؛ باڵوێز؛ باڵباز؛ شابەندەر؛ بایلۆز؛ سەفیر؛ بریکاری دەوڵەت لە دەوڵەتێکی‌تردا؛ سپاردەی میری: **سفیرکبیر**

◘ **سفیر آکردیته**: نوێنەری فەرمی وڵاتێک لە وڵاتێکی‌تردا کە دانیشتووی ئەوێ نیە، بەڵام لە کاتی پێویستدا لەوێ دەبێ.

**سفیر سیار**: باڵوێزێ کە بۆ جێبەجێ‌کردنی کار و ئەرکی پێ سپێردراو، سەردانی وڵاتانی جۆراوجۆر دەکا.

**سفیرکبیر** / safîrkabîr/: [عربی] ☜ **سفیر**

**سفیل وسرگردان** / safîl-o-sargardān/: صفت. [گفتاری] ١. وێڵ؛ سەرگەردان؛ وێڵ و وەیلان؛ ئاوارە و دەربەدەر؛ تاروتەرە ‹صاحبخانه بیرونمان کرد و ماندیم سفیل‌وسرگردان: خاوەن‌ماڵ دەرمانی کرد و وێڵ و سەرگەردان داکەوتین› ٢. دەستەپاچە؛ قەتیس؛ سەرگەردان؛ سەرلێ‌شێواو ‹توی خیابان، یک ساعت سفیل‌وسرگردان بودم: لە ناو شەقامدا، سەعاتێک دەستەپاچە بووم›.

**سفینه** / safîne ، ـها/: [عربی] اسم. ١. / سفاین/ [نامتداول] کەشتی؛ پاپۆڕ؛ گەمیە ٢. کۆمەڵە نووسراوەیەکی جۆراوجۆر بەتایبەت شیعری دڵداری ٣. [نجوم] ☜ **کِشتی ـ ٢**

◘ **سفینه‌ی فضایی**: ناو کیهانی ☜ **ناو**

**سفیه** / safîh ، ـها؛ ـان؛ سُفَها/: [عربی] صفت. خەشۆ؛ دەبەنگ؛ کەم‌ئاوەز؛ حۆل؛ بلح؛ بالە؛ سائەقڵ؛ گەوج؛ لاژگ؛ کەم‌عەقڵ.

**سق** / saq(q)/: اسم. [گفتاری] مەلاژ؛ مەلاژوو؛ مەلاژی؛ مەلاژگ؛ مەلازە؛ مەلاشۆ؛ مەلاشوو؛ ملاشک؛ مەلاشک؛ ملازگ؛ ئاسمانە؛ لاوس؛ بن‌میچی زار.

◘ **سق سیاه**: [مجازی] ١. قۆشمە؛ قۆشە؛ بەد ودم؛ دەم‌ڕەش ٢. کەسێ کە پێشگۆیی خراپ بکا و خەونەکانیشی بێنە دی.

◘ **سق زدن**: ١. خووساندنی خواردەمەنی (وشک) لە ناو دەمدا؛ دە زار زەلاندن

۲. *[مجازی]* خواردنی شتی ڕەق و وشک.

**سق کسی را با چیزی برداشتن:** *[کنایی]* ناوک/ فرچکی کەسێک بە شتێ بڕین؛ خوو پێ گرتن ‹مثل اینکه سق او را با دروغ برداشته‌اند: وا دیارە ناوکیان بە درۆ بڕیوە›.

**سقا** / saqqā ، ـها؛ ـیان/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* ئاوکێش؛ تێراوی؛ ئاوبەر؛ سەقا؛ کەسێ کە خەڵکی تێراو دەکرد، بەتایبەت ئەوەی لە هەمبەر وەرگرتنی پارەوە، ئاوی خواردنی دەبردە بەرماڵان.

**سقائی** / saqqā'î/: [عربی] ☜ **سقایی**

**سقاخانه** / saqqāxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[قدیمی]* سەقاخانە؛ کەندێکی گچکە لە دیواری بوارگە و کۆڵاناندا، ئاوی خواردنەوەیان لێ دادەنا و ڕێزێکی ئاینی هەبوو.

**سقاهک** / saqqāhak/: [عربی/ فارسی] ☜ **دُم‌جُنبانَک**

**سقایی** / saqqāyî/: [عربی]/اسم. ئاوکێشی؛ سەقایی؛ ئاوبەری: **سقائی**

**سقز** / saqqez/: اسم. بنێشت؛ بنیشت؛ بەنیشت؛ بەنوشت؛ جاچکە؛ داچکە؛ چاچک؛ چاچکە؛ جاجک؛ جاجگ؛ ژاژکە؛ ژاژک؛ وێژەن؛ شیلەی دارەبەن؛ شیرەی دار قەزوان کە لە کوردەواریدا زۆر ناسراوە.

**سقط** / saqat/: [عربی] *صفت.* سەقەت؛ سەکەت؛ سەکت: ۱. مردارەو بوو؛ بە لادا هاتوو؛ مردوو ۲. تۆپیو؛ تۆپیگ؛ تۆپی پۆخڵەوات؛ لەکارکەوتوو؛ زایە بووگ؛ عەیبدار ٤. *[نامتداول]* خراپ؛ پەست.

▣ **سقط شدن:** زنگرین؛ تۆپین؛ تۆپان؛ تۆپەی؛ تۆپای؛ کەوتین؛ شیاین؛ سەکتین؛ فەتین؛ سەکەت بوون؛ تۆپەڕابوون؛ هەڵتۆپین؛ هەڵتلۆپین؛ مردار بوونەوەی گیانەوەران ‹یکی روستایی سقط شد خرش: دانێ لاگەیی کەرەکەی تۆپی›.

**سقط کردن:** سەکەت کردن؛ تۆپاندن؛ کەوتاندن؛ هەڵتلۆپان؛ مردارکردنەوەی گیانەوەران ‹آخرش این حیوان بیچاره را سقط می‌کنی: ئاخری ئەم بێزوانە سەکەت دەکەی›.

**سقط گفتن:** *[نامتداول]* جنێودان؛ دژوێن دان؛ سکانن؛ ڤیلین؛ دژمان دەی/ دای.

**سقط** / seqt/: [عربی]/اسم. کارەڕەهاتی داکەوتن؛ لە بار چوون. هەروەها: **سقط کردن**

▣ **سقط جنین:** کار یا ڕەوتی بەراوتین؛ بەر هاویشتن؛ بەر تەوانن (بۆ گیانەوەر)؛ بەرخستن؛ لە بار چوون؛ منداڵ زیان کردن؛ لەبارچین؛ هاتنە دەرەوەی پیزە لە پزداندا بە مردوویی و زۆرتر بەر لە کاتی خۆی.

**سقط آور** / seqtāvar/: [عربی/ فارسی] *صفت.* لە بار بەر؛ بارخەر؛ زیان پێکەر؛ بە تایبەتمەندی لەبار بردنی بێچووی ناوزگ.

**سقط‌فروش** / saqatfurûš ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[قدیمی]* وردەواڵە/ وردکەواڵە فرۆش. هەروەها: **سقط‌فروشی**

**سقف** / saqf ، ـها/: [عربی]/اسم. ساپیتە: ۱. میچ؛ ساپیتک؛ سەراپیتە؛ سڤیک؛ ئاسمانە؛ کاش؛ بن‌میچ؛ سرمیچ؛ کاشخانک؛ بنساپیتە؛ بن‌بان؛ بنۆدارا؛ پۆشەنی بان ماڵ یان کەرەسەی سەرنشیندار ‹سقف خانه: میچی خانوو› ۲. *[اقتصاد]* سەراوان؛ بانترین ئاستی پەردەژی.

▣ **سقف دهان** ☜ **سق**

**سقف کاذب:** بن میچێ لە ژێر میچی سەرەکیدا کە بارێک هەڵناگرێ و بۆ جوانکاری یان داپۆشینی لوولە و کاناڵ، سازی دەکەن.

▣ **سقف زدن:** میچ لێدان؛ سەرگرتن؛ بن‌میچ گرتن؛ سرمیچ‌گرتن؛ دارەڕا کردنی ماڵ؛ سەری خانووگرتن ‹فردا سقف را می‌زنند: بەیانی میچ لێ‌دەدەن›.

**سقلمه** / soqolme ، ـها/: [ترکی]/اسم. *[گفتاری]*

زوقورتمــه؛ سـیخورمه؛ سـێخوڕمه؛ سـوخورمه؛ زەخــت؛ زەختــه؛ کــولم؛ نوکورتــه؛ کلێنجــی؛ مستەکول؛ مستەکۆلە؛ مشتەکۆڵ؛ مشتەکۆلە.

**ســـقمولیمس** / saqmolimos/: [یونــانی]/اســم. دڕکەزەردە؛ زەردەسیری؛ گیـایێکی دەشـتەکی بە گەڵای گەورە، درووی زەرد، گوڵی بنـەوش و ڕەگی ئەستوورەوە کە شیرینە و دەخورێت.

**سـقمونیا** / saqmûniyā/: [معـرب از یونـانی]/اسـم. خەشیک؛ خوشیلک؛ گیاییێکی خۆهەڵـواس، بـە گوڵی زەرد، زەمقێکی ڕیسنی ڕەوانکـەرەوە کـە لە ڕەگەکەی دەردەهێنریت.

**سقنقور** / saqanqûr ، ـهـا؛ ـان/: [معـرب از لاتینـی]/اسـم. گیانەوەرێکی خزۆک و زینـووزای تایبـەتی گەرمێنانە بە دەستی سـپیەوە کـە لـە ناوچـەی گەرم و فێنکدا دەژی: **ریگ‌ماهی**

**سقوط** / soqût, suqût/: [عربی]/اسـم. ١. کار یـان ڕەوتی داکــەوتن؛ داکــەتن؛ کــەتن؛ کــەوتن؛ ئەرەکەوتەی؛ کەوتەیرە؛ بەر بوونەوە؛ وەر بیـەی؛ ڕسیان؛ هەڵدێران؛ حەوانچە بوون ‹سقوط سـنگ: داکەوتنـی بـەرد› ٢. ڕەوتی دابـەزین؛ داکـشان؛ هاتنەخوار؛ هندکین؛ کەم بوونەوە؛ نـزم بوونـەوە ‹سقوط قیمت‌ها: دابەزینـــی نرخگـەل› ٣. *[مجازی]* کارەڕەهاتی ڕووخان؛ وریەی؛ لە سەر کار یان پا و پلەی خـۆ لا چـوون ‹سـقوط دولـت: ڕووخانـــی دەولـەت› ٤. *[مجـازی]* شـکان؛ ڕووخـان؛ بـار و دۆخــی داگیرکــران لــە لایــەن دوژمنــەوە؛ بــە دەســتەوە دران‹سـقوط بـرلین: شکانـــی بـرلین› ٥. شــکان؛ دۆخ یــان چۆنیــەتی لــەدەس‌دانی پێگەی ئاکاری یان کۆمەڵایـەتی خـۆ ‹انحطـاط و سقوط جوانان خوشگذران و بی‌خبـر: شـکان و فـەوتانی لاوانی خۆشڕابوێر و بـێ‌ئاگـا›. هـەروەها: **سـقوط کردن**

◙ **سقوط آزاد:** دۆخ یان چۆنیەتی بـەر بوونـەوە؛ تەکەر بوونەوە؛ داکەوتن یان داتەکینی شتێک لە بەرزیەکەوە، بەبێ گوشارێک لە سەری.

**ســک** / sok ، ـهـا/: اسـم. *[گفتـاری]* ١. نــەقیزە؛ نــەقیزێ؛ زەخــت؛ زەختــە؛ زەقــت؛ ســۆکە؛ پیرەسی؛ شەبیک؛ دارێ نووک‌تیژ کە چـارەوێی پێ لێدەخوڕن ٢. هەرشتێکی وەک نەقیزە.

◙ **سک زدن:** نەقیزە دان؛ سیخ دان؛ زیخاندن.

**سکام** / sekām/: [فرانسوی]/اسم. سێکام؛ جۆرێـک پیشاندانی ڕەنگی وێنەی تەلەفیزیۆنی.

**ســکان** / sokkān ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. سـوکان؛ ئامێری بەڕێوەبـردنی کەرەسـتەگەلی سـەر ئـاو (گەمیــە، لۆتکــە و...) یــان باڵــگرەوە (فڕۆکــە، هیلی‌کوپتر و...).

**سکاندار** / sokkāndār ، ـان/: [عربی/ فارسی]/اسـم. سوکاندار؛ بەڕێوەبەری کەرەستەگەلی سـەر ئـاو یان باڵگرەوە.

**سکانس** / sekāns ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. سێکانس؛ زەنجیرە دیمەنی یەک لـە دوای یـەکی فیلمـێ کە بابەت یان ڕووداوێکی دیاریکراو نـیشان دەدا و بە ڕوونبوونەوەی بەرەبـەرەی دیمـەن دەس پێدەکا و بە تاریک بوونەوەی کۆتایی دێت.

**سکتاریسم** / sektārîsm/: [فرانسوی]/اسم. *[سیاست]* تاقم‌خوازی؛ خوازیاری و هۆگری بۆ پێک‌هـاتنی تاقمێکی جیاواز یان خۆ دانەپاڵ کۆمەڵێکی وا.

**سکته** / sakte, sekte ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. قۆتک؛ وەستان؛ وێست؛ مفاجـات؛ موفاجـات؛ سـەکتە؛ دۆخ یان چۆنیەتی وەستانی لە نکـاوی دڵ یـان مێشک ٢. *[ادبی]* دۆخ یا چۆنیەتی تێـک‌چـوونی کێشی شێعر.

◙ **سـکتەی قبـیح:** *[ادبـی]* هەڵـبەزینەوە؛ دۆخ یـا چۆنیەتی شێوانی کێشی شیعر بە شێوەیەکی زەق و ناخۆش.

**سکتەی قلبی:** دڵەکپێ؛ وێستی‌دڵ؛ دۆخی لـە لێدان کەوتنی دڵ.

**سکتەی کامل:** وێستی تەواو؛ سەکتەی تـەواو؛ شەپلەیەک کە مەرگی بە دواوەیە.

**سکتەی مغزی:** سـەکتەی مـەغزی؛ شـەپلەی

مێشک؛ بێهۆشی و بوورانەوەی دەم و دەست بە هۆی گیرانی دەمارێکی مێشک بە تنۆکە خوێنێکی گیرساو یان هەرچێکی‌تر.
**سکتەی ملیح:** *[ادبی]* هەلّدانەوە؛ هەلّبەزینەوەی کێشی شیعر بە شێوەی وچانێکی کورت و هێز دان لە سەر وشەیەک، کە دەبێتە هۆی جوانی و ڕازانەوەی وتار.
**سکتەی ناقص:** سەکتەی ناتەواو؛ لە کارتە بوونی دەماری سەر بە بزاوی ویستەکی بەشێ لە لەش بە هۆی سەکتەوە.
▣ **سکته کردن:** سەکتەکردن؛ شەپلە لێدان.
**سکر** / sokr/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* مەستی؛ سەرخۆشی.
**سکرآور** / sokrāvar ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* مەستەمەنی؛ مەستی‌هێن؛ مەستکەر.
**سکرات** / sakarāt/: [عربی]/اسم. ١. مەستی؛ سەرخۆشی؛ دۆخی بێ‌خەبەری بە هۆی مەستیەوە ٢. دۆخی لە هۆش چوون و بێ‌ئاگایی لە کاتی سەرە مەرگدا.
**سکرتر** / sekreter/: [فرانسوی]/اسم. نووسیار؛ ڕازگر؛ نهێنیگر؛ نویسیاری (زۆرتر) ژن کە وەئەستۆگری نووسینگەی بەرپرسانە.
**سکس** / seks/: [انگلیسی/ فرانسوی]/اسم. سێکس؛ کار و باری جینسی.
**سکستان** / sekstān/: [فرانسوی]/اسم. سێکستان: ١. /ـها/ ئامێری ئەندازەگرتنی مەوداگەلی گۆشەیی بۆ دۆزینەوەی شوێنی کەشتی یان فڕۆکە ٢. *[نجوم]* وێنەیەکی ئاسمانی لە لەتەگۆی باشووریدا کە وەکوو سێ‌پایەیێکی وێنەگری وایە.
**سک ـ سک** / soksok/: *صوت.* شار ـ شار؛ قەلە؛ وشەیەکە منداڵان لە یاری چاوشارکێدا دووپاتەی دەکەنەوە.
**سکسکه** / sekseke ، ـها/: اسم. نزگەرە؛ نزگەرێ؛ نزرگ؛ نزرە؛ نزێرە؛ نیزرێ؛ نزگەرە؛ ئیسک؛ ئیسکە؛ عیسک؛ نسکە؛ هەسر؛ سهی؛ هەرس؛ بەرسنجک(سۆک)؛ چۆنیەتی گرتنەوە و بەردانی دیافراگم کە دەبێتە هۆی حالێکی وەکوو هەناسەبڕکێ بە دەنگێکی تایبەتەوە.
**سکسی** / seksî/: [انگلیسی/ فرانسوی] *صفت.* سێکسی: ١. پێوەندیدار بە کار و باری جینسی ٢. هۆک بزوێن؛ هۆکاوی؛ هەوەساوی؛ هەوەس هەلّسێن.
**سکنا** / soknā/: [عربی]/اسم. ئاکنجێتی؛ نیشتەجێیی؛ ڕەوتی جێ‌گرتن و مانەوە لە شوێنێک: **سُکنی**
**سکنات** / sakanāt/: [عربی]/اسم. حاڵ‌وباڵ؛ دۆخ و جووڵی ناویستەکی کەسێ لە حالەتێکی تایبەتدا.
**سکنج** / sekonc, sokonc/: *صفت. [قدیمی]* ١. دەمزل؛ زاردڕاو ٢. دەم بۆگەنیو؛ دەم‌بۆگەن ٣. حەفلچ؛ لێوتلیشاو؛ لێوکەت؛ لەوشەقەتا.
**سکنجبین** / sekancabîn/: [معرب از کردی]/اسم. سکەنجەبین؛ ئەسکەنجەبین؛ ئەسکەنجەمین؛ شەربەتی سرکە و هەنگوین: **سِرکنگبین؛ سکنگبین**
**سکندری** / sekandarî/: اسم. لەتر؛ تەڕپل؛ تەسە؛ تەپوخ؛ توێغ؛ نوچ؛ ڕەت؛ سەتمە؛ ساتمە؛ سەرتقلی؛ سەرتۆقلی؛ سەرەنگرێ؛ سەرسم؛ سەرسمتی؛ هەلّەنگوتە؛ لەدەس‌چوونی خۆڕاگری بۆ تاوێک بە هۆی پا هەلّکەوتن یان پاچەقول بوون.
▣ **سکندری خوردن:** هەلّەنگوتن؛ هەلّەنگووتن؛ هەلّنگفتن؛ هەلّنگافتن؛ هلنگفتن؛ هەلّنووتن؛ هەلّنووتان؛ تەڕپلین؛ گلان؛ گلێرەی؛ ساتمە کردن؛ ساتمە دان؛ سەرەنگرێ بوون؛ ڕەت بردن؛ پا هەلّکەفتن؛ لەتر دان؛ نوچ بردن/ دان؛ سەرسم دان.
**سکنگبین** / sekangabîn/: [از کردی] ☜ **سِکَنجَبین**

**سکنه** / sakane/: [عربی] جمعِ ☜ **ساکِن**

**سکنی** / soknā/: [عربی] ☜ **سُکنا**

**سکو** / sakû ، ـها/: *اسم.* سەکۆ؛ ساکۆ: ١. دکە؛ دووشک؛ زاب؛ ڕووبەرێکی تەختان کە بە کەرەسەی ساختمانی چێ دەکرێ و پتر بۆ دانیشتن بەکاردێ ٢. پێرک؛ هەرزاڵ؛ ئاوا پێکهاتەیێ بۆ دانان یا دامەزراندنی ئامێر، کەرەسە یان دەم و دەزگایەک بە سەریەوە ‹سکوی پرتاب موشک: سەکۆی هاویشتنی مووشەک› ٣. ڕووبەرێ تەخت و قوت بۆ سوار بوون و دابەزین لە قەتار یا بار کردن و داگرتن و شتی وا ‹سکوی راه‌آهن: سەکوی هێڵی ئاسن› ❊ **سکوب**

▣ **سکوی چادر**: تەبارە؛ تەرواڵ؛ پێرک.

**سکوی حفاری**: سەکۆی هەڵکۆڵین؛ تەختانێک (بەتایبەت بە سەر کۆمایەکی ئاودا) کە دەکەڵ و کەڵوپەلی هەڵکۆڵینی بە سەرەوە دادەمەزرێ.

**سکوب** / sakkûb/ ☜ **سکو**

**سکوت** / sukût, sokût/: [عربی] *اسم.* بێدەنگی: ١. بم؛ قڕوقپ؛ خامۆشی؛ کپی؛ نز؛ دۆخ یا چۆنیەتی نەبوونی دەنگ و هەرا ‹سکوت بر همه‌جا حاکم بود: بێدەنگی باڵی بەسەر هەموو شوێنێکدا دابوو› ٢. مات؛ مق؛ کار یان ڕەوتی بێدەنگ بوون؛ هیچ نەوتن؛ دەنگ نەکردن ‹چرا سکوت کردی؟: بۆچی بێدەنگ بووی؟›.

▣ **سکوت شدن**: دەنگ نەمان؛ هەرا بڕیان؛ لە دەنگ کەوتن؛ بێدەنگ بوون؛ قڕ و قپ بوون.

**هەروەها**: **سکوت بودن**

**سکوت کردن**: قسە نەکردن؛ بێدەنگ بوون؛ وست بوون؛ مات بوون؛ کپ بوون؛ هیچ نەگوتن؛ نق نەکردن؛ نق‌کەردەی.

**سکولار** / sekolār/: [از انگلیسی] *صفت.* سیکولار؛ لادینی؛ نادینی؛ دین‌لایی.

**سکولاریسم** / sekolārîsm/: [فرانسوی] *اسم.* سیستەمی لادینی؛ سیکولاریسم؛ سیستەمێ حکوومەتی یان فێرکاری کە کاری بە سەر ئامۆژەگەلی دینیەوە نیە.

**سکون** / sukûn, sokûn/: [عربی] *اسم. [ادبی]* هەدا؛ هەدار؛ نەجمی؛ تۆقرە؛ ئۆخژن؛ هەندر؛ بێ‌خوستی؛ بێ‌جم؛ ماتی؛ بێ هەست و خوستی.

**سکونت** / sukûnat, sokûnat/: [عربی] *اسم.* نیشتەجێیی؛ سەقامگیری؛ ئاکنجێتی؛ گلەوبەری؛ دیماتی؛ کاری هەدا دان و نیشتەجێ بوون لە شوێنێکدا بەتایبەت بۆ ژیان.

▣ **سکونت داشتن**: نیشتەجێ بوون؛ جێگیر بوون؛ مانەوە؛ هێورین.

**سکونت کردن**: مانەوە؛ نیشتەجێ بوون؛ دانیشتن؛ مەزران ‹مدتی درخانه‌ی خویشاوندانش سکونت کرد: ماوەیەک لە ماڵی خزمانیدا مایەوە›.

**هەروەها**: **سکونت گزیدن**

**سکه** / sekke ، ـها/: [عربی] *اسم.* سککە؛ سکە؛ سکێ؛ قەرەپووڵ؛ پارەی لە کانزا.

▣ **سکه بودن کار کسی یا چیزی**: *[مجازی]* وەبرەو بوونی/ لە سەر دەور بوونی کاری کەسێک ‹امروز کار دلال‌ها سکه است: ئەمڕۆ کاری دەلالەکان وەبرەوە›.

**سکه زدن**: ١. سکە لێدان؛ پووڵ لێدان؛ دراوکوتان ‹دولت سکه‌ی ٥٠ تومانی زده است: دەوڵەت سکەی ٥٠ تمەنی لێداوە› ٢. *[مجازی]* پووڵ ماشینەوە؛ پووڵ ماشتنەوە؛ پووڵ گەسک دان؛ پارە لە چاپ دان؛ درامەتی یەکجار زۆر بوون ‹فروشندگان زمین دارند سکه می‌زنند: زەوی‌فرۆشان پووڵ دەماشنەوە›.

**سکه‌ی یک پول کردن**: *[مجازی]* بە پووش دەر کردن؛ بێ برەو و قیمەت‌کردن ‹با حرفهایی که زد، او را سکه‌ی یک پول کرد: بەو قسانە کردی، بە پووش دەری کرد›. هەروەها: **سکه‌ی یک پول شدن**

**از سکه انداختن**: *[مجازی]* لە برەو خستن؛ بێ

برەو و بێ بایەخ‌کردن؛ بێ‌قیمەت‌کردن ‹بد اخلاقی او، کارش را از سکه انداخته بود: بێ‌ئاکار بوونی، کارەکەی لە برەو خستبوو›. هەروەها: **از سکه افتادن**

**سکه ای** / sekke'î/: [عربی/ فارسی] *صفت.* سکەیی؛ پوولی؛ دراوی ‹تلفن سکه‌ای: تەلەفوونی سکەیی›.

**سکه شناسی** / sekkešenāsî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* سکەناسی؛ زانستی پێوەندیدار بە لێروانین و ناسینەوەی سکەگەلی سەر بە ولاتان و سەردەمگەلی جۆراوجۆری مێژوویی.

**سکیدن** / sokîdan/: *مصدر. متعدی. [گفتاری]* // **سکیدی:** سیخاندت؛ **می‌سکی:** دەسیخێنی؛ **بِسک:** بسیخێنە// ١. سیخاندن؛ زیخاندن؛ بە زیخ ئاژنین؛ سیخ دان؛ بە سیخ لێدان ٢. کۆلین؛ هەڵکۆلین؛ هلکەواشتن؛ هلکەوشاندن؛ دانەوە؛ کنەکردن ✽ سک زدن

**سکیزیدن** / sekîzîdan/: *مصدر. متعدی. [قدیمی]* هەڵتۆزان؛ هەڵتووزان؛ هەڵتۆزاندن؛ هەڵتووزاندن؛ هەڵتیزان؛ هەڵتیزاندن؛ هەڵجووزان؛ هەڵجووزانن؛ هەڵجووزین؛ جووتە هاویشتن؛ لەقە وەشاندن؛ جۆتلێ شای؛ لووشکە هاویشتن و هەڵبزوقین.

**سگ** / sag/: *اسم.* سەگ: ١. ـها؛ ـان/ سەو؛ سەی؛ سە؛ سپەڕ؛ سەپەکە؛ کۆچەک؛ کوچک؛ کووچک؛ گەماڵ(نێر)؛ دەڵ (بۆ مێ)؛ کوسۆک؛ کووتی؛ کسۆک؛ تووتە؛ کەلپ؛ گیانەوەری گواندار و گۆشتخۆری کەوی، پەنجەڕوو، بە چوار قامکی کۆوەبوو لە پێدا، کە لە گورگەوە نزیکە ٢. یازدەهەمین ساڵی ڕۆژمێری تورکستانی ☜ **تقویم** ٣. *[نجوم]* دوو وێنەی گەردوونی لە ئاسمانی لەتەگۆی باکووریدا.

▣ **سگ آبی:** سەگاو؛ سگاوی؛ سەگاف؛ سەگاقی؛ سەگالا؛ سەیاف؛ مێکێ ئاقێ؛ مەیکێ ئاقێ؛ میائاقێ؛ گیانەوەرێکی مەلەوانە، زیاتر ماسی و ئاوژیان دەخوا و پێست و ڕۆنەکەی زۆر بەنرخە.

**سگ بزرگ:** وێنەیەکی ئاسمانی لە ڕۆژهەڵاتی باشووری کەلووی ڕاوچیەوە کە شەعرای یەمانی پرشنگدارترین ئەستێرەیەتی. **کلب‌اکبر**

**سگ پلیس:** سەگی پۆلیس؛ بەشدار؛ جۆرێ سەگ کە لە دۆزینەوەی تاوانکاران یا کەسانی جێ‌گومان، یارمەتی پولیس دەدا.

**سگ تازی** ☜ **سگ شکاری**

**سگ حسن‌دله:** *[کنایی]* سەگی هەواران؛ سەگە خوێڕی؛ سەگی بەڕەڵا؛ نمانای «خوێڕیەتی»، «خۆتێهەڵقوتێنی» و «بێکارەیی»؛ کەسی خوێڕی و بێکارە کە سەر بە هەموو شوێنێکدا دەکا.

**سگ خانگی:** سەگی ماڵی؛ سەگی لینی.

**سگ راهنما:** سەگی ڕێشاندەر؛ سەگی ڕاهاتوو بۆ ڕێ پیشاندانی کوێران.

**سگ روسیاه:** *[کنایی]* سەگەڕەش؛ سەگی ڕووڕەش؛ مرۆڤی تاوانباری خوێڕی.

**سگ شکاری:** تەڵ؛ تانجی؛ تانجیە؛ تاژی؛ جۆرێ سەگ کە بە بۆن یا دیتن دەکەوێتە شوێن نێچیر: **سگ تازی**

**سگ کوچک:** سەگە چووکە؛ وێنەیەکی گەردوونی لە ڕۆژهەڵاتی کەلووی ڕاوچی کە بە چاو تەنیا یەک ئەستێرەی بە ناوی شەعرای شامی دیارە: **کلب اصغر**

**سگ گله:** شامبۆیی؛ تووڵ؛ گۆڵ؛ گەماڵ؛ سەگێ کە بۆ چاوەدێری ڕان ڕاهێنراوە.

▣ **سگ شدن:** *[مجازی]* بوونە سەگ؛ خراو هەڵچوون؛ زۆر توورە یان وەڕەز بوون ‹امروز راننده‌مان سگ شده بود و پاچه‌ی همه را می‌گرفت: ئەمڕۆ ئاژۆرەکەمان ببووە سەگ و دەرپاچەی هەمووی دەگرت›.

**سگ صاحبش را نشناختن:** *[کنایی]* سەگ خاوەنی خۆ نەناسین؛ تووتە وەی نەژناسەی؛

زۆر زڵە و شپرزە بوون ‹آن قدر شلوغ بود کە سگ صاحبش را نمی‌شناخت: ئەوندە شلووغ بوو سەگ خاوەنی خۆی نەدەناسی›.

**سگ کسی به چیزی یا کسی ارزیدن:** *[تعریض]* تاڵەمووی کەسێ سەد شت/ کەسی‌تر هێنان؛ زۆر سووک و بێبایەخ بوونی شتێ لە چاو شتێکی‌تر ‹سگ آزاد می‌ارزد به صدتا مثل دارا: تاڵەموویەکی ئازاد سەدی وەک دارا دێنی›.

**سگ کسی نبودن:** *[تعریض]* سەگی جێگایێ/ شوێنێ نەبوون؛ هیچ گەم و بایەخێک نەبوون ‹ارباب سگ کیست که بخواهد مرا از زمینم بیرون کند: ئاغا سەگی کوێیە بیەوێ من لە زەوی خۆم هەڵکەنێ›.

**سگاله** / sagāle ، ـها/: *اسم.* کوێری چەوان؛ کوورەی چەودەن؛ جۆرێ کارگی مێملێ گیای چاوداره کە دەرمانی خوێن‌ڕاگری ئیرگوتینی لێ دەگرن.

**سگالیدن** / sagālîdan/: *مصدر. لازم. [نامتداول]* // **سگالیدی:** ڕامای؛ **می‌سگالی:** ڕادەمێنی؛ **بسگال:** ڕامێنە// ڕامان؛ پۆنجین؛ دەبراندن؛ بیرکردنەوە؛ هزرکرن.

**سگ‌انگور** / sagangûr/ ☜ تاجریزی سیاه، **تاجریزی**

**سگباد** / sagbād/: *اسم. [تعریض]* هاری؛ نەخۆشینی سەگی دڕ ‹مواظب باش! امروز رئیس سگباد دارد: وریای خۆت بە! ئەورۆ سەرۆک هاری گرتووە›.

**سگ‌توله** / sagtûle/ ☜ **توله‌سگ**

**سگ‌جان** / sagcān/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* گیان‌سەخت؛ سەگ‌گیان ‹این ساعت خیلی سگ‌جان است؛ تا حالا چند دفعه از دستم افتاده، باز کار می‌کند: ئەم ساعەتە زۆر گیان‌سەختە، تا ئێستا چەند جار لە دەستم داکەوتووە، هێشتا هەر کار دەکا›.

**سگ‌خور** / sagxor/: *صفت. [مجازی]* سەگ‌خۆر؛ سەگ‌خواردگ؛ لە بار بۆ خۆراکی سەگ (جۆرە جنێوێکە کاتی دانی شتێک بە ناچاری و نابەدڵی دەگوترێ بە مانای وادەزانم سەگ خواردوویەتی) ‹بگیر، این هزار تومان هم سگ‌خور!: بگرە، ئەم سەد تمەنیشە سەگ‌خۆر!›. هەروەها: **سگ‌خور شدن؛ سگ‌خور کردن**

**سگدانی** / sagdānî ، ـها/: *اسم.* کولەسە؛ کۆڵە: ١. کولانەسەگ؛ جێگا و کونی سەگ ٢. *[کنایی]* کونەڕێوی؛ کۆڵیت؛ ئەنزەلۆک؛ جێگای زۆر پیس و تەنگ ‹یعنی تو به این سگدانی می‌گویی خانه؟: یانێ تۆ بەم کولەسەیە ئێژی ماڵ؟›.

**سگدست** / sagdast/: *اسم.* سەگدەس؛ جمگەیێ لە ماشیندا کە چەرخ بە مێڵەیەکەوە (بەناو مێڵەی سەگدەست) دەلکێنی بە تەوەرەی چەرخەکان (ئیکسێل)ەوە.

**سگدو** / sagdow, -do:/: *اسم. [گفتاری]* تەقلەدەو؛ تەق‌ودەو؛ ڕاوێچکە؛ ڕاوێژکە؛ هات‌وچۆی زۆر و بێخو.

◘ **سگدو زدن:** تەقلەدەو دان؛ تەق‌ودەوکردن ‹چقدر توی این شهر برای یک اتاق خالی سگدو زدم: چەندە لەم شارە بۆ وتاغێکی چۆڵ تەقلەدەوم دا›.

**سگدوی** / sagdovî/: *اسم. [گفتاری]* تەقلەدەو؛ تەق‌ودەو.

**سگرمه** / segerme ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* خەت توێڵ؛ لۆچی تەوێڵ؛ ناوچاو.

◘ **سگرمه‌های کسی توی هم بودن:** *[کنایی]* ناوچاوانی کەسێ بۆران‌کردن؛ ناو چاو کەسێک گرژ بوون؛ تووڕە یان نارەحەت بوونی کەسێ ‹چه شده؟ سگرمه‌هایت توی هم است: چ بووە؟ ناو چاوانت بۆران دەکا›. هەروەها: **سگرمه‌های کسی توی هم رفتن**

**سگ‌زبان** / sagzabān ، ـها/: *اسم.* گەماڵدۆ؛ گەماڵدوو؛ دووـ دووکەر؛ دوودی کەرە؛ گیایێ ئالیکی دووسالان، بە ڕەگی ئەستوور، لاسکی ڕاست، گەڵای تەسک و نەرم و گوڵێ هێشوویی سوور یان بنەوشەوە کە گەڵا و ڕەگی بۆ دەرمان

دەشێ.

**سگسان** / sagsāān ، ـان /: *صفت.* سەگاسا؛ تووتەئاسا: ١. سەگسار؛ وەک سەگ ٢. سەر بە تیرەی سەگان.

**سگک** / sagak ، ـها/: *اسم.* بەرەزبانە؛ بەرەزوانە؛ مەلەزوانە؛ ئاڵقەزوونە؛ ئاوزوون؛ ئاوزوونە؛ ئاغزونە؛ سێر؛ پزیم؛ پزێم؛ قرتە؛ قرتێنە؛ نەڕما؛ نەڕمادە؛ نێرامێ؛ نێر و مێ؛ نێرەمۆک؛ نێرەومێ؛ ئاڵقەی ددانەداری کانزا کە کورەکی تێدایە و بۆ داخستنی قایشی کەمەر و کەوش و بەرەزین و... بە کار دەبرێ.

**سگ‌کش** / sagkoš/: *اسم.* سەگ‌کوژ؛ سەگ‌تۆپێن: ١. کەسێ کە کاری کوشتنی سەگەلە ٢. کارەڕەهاتی کوشتنی گیانداری بە جەزرەبە و ئازاری زۆر؛ شکەنجەکوژکردن. هەروەها: **سگ‌کش کردن**

**سگ‌کن** / sagkan/ ☜ **مِهرگیاه**

**سگ‌لرز** / saglarz/: *اسم.* [مجازی] لێوەلەرزە؛ دانەڕچە؛ ددانەچیرە؛ ددانەتەقێ؛ لەرزی ئاستەم.

**سگ‌ماهی** / sagmāhî ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سەگماسی؛ جۆرێک لە ماسیانی ورد بە لەشی باریک و گرۆڤەرەوە کە لە مێرووان و بێمۆرغەیان دەخۆن.

**سگی** / sagî/: *صفت.* [مجازی] سەگی؛ ناخۆش؛ نالەبار؛ پیس؛ زۆرخراپ ‹زندگی سگی: ژیانی سەگی›.

**سل** / sal ، ـها/: *اسم.* پردەباز؛ کەلەک؛ کەلەس؛ کەلەسپردی سەرسەری، بەتایبەت تەختە یان هەلووکگەلێ کە بۆ پەڕینەوە بە سەر رووبارا دادەنرێ.

**سل** / sel(l)/: [عربی] *اسم.* ئازاری سی؛ باریکە؛ سیل؛ ئازارەسیل؛ ئازارەباریکە؛ دەردەباریکە؛ ژانەزراف؛ نەخۆشیەکی چلکی درێژخایەنە لە مرۆ یان گیانەوەراندا کە بە هۆی باسیلی کوخەوە بەدیدێت.

▣ **سل ارزنی:** دیق؛ دیق؛ نەخۆشی سیل کاتێ کە باسیلەکەی دەگاتە خوێن و لەوێوە بە هەموو لەشدا بلاو دەبێتەوە.

**سل استخوان:** سیلی پێشە؛ سیلی ئێسک؛ نەخۆشینی ئازارە باریکە کە بە هۆی تەنینەوەی باسیلی کوخ بۆ مێشکی ئێسک دەبێتە هۆی دەردانی زیپکەی چلکی و گەنین و تێکچوونی ئێسک.

**سل پرندگان:** ئازارە باریکەی باڵندە.

**سل ریه:** ئازاری سی.

**سل گاوی:** ئازارەباریکەی چێڵ.

**سل** / sol/: [فرانسوی] *اسم.* [موسیقی] سۆل؛ پێنجەمین نۆتی مووسیقا.

**سلاح** / selāh ، ـها؛ اسلحه؛ تسلیحات/: [عربی] *اسم.* چەک؛ تەرک؛ چەکان: ١. ئامرازی شەڕ؛ جەنگامێر ٢. [مجازی] هەر چەشنە ئامێرێ کە پێی شەڕ بکرێ ‹دشمن از سلاح تفرقه انداختن استفاده می‌کند: دوژمن لە چەکی دووبەرەکی نانەوە کەلک وەردەگرێ›.

▣ **سلاح سرد:** اسلحەی سرد ☜ **اسلحه**

**سلاح گرم:** اسلحەی گرم ☜ **اسلحه**

**سلاخ** / sallāx ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* ١. گورێن؛ سەربڕی حەیوان ٢. [کنایی] کوشتۆخ؛ قەلاچۆکار؛ ڕەش‌کوژ؛ کەسێ کە خەڵکی بێتاوان دەکوژێ.

**سلاخ خانه** / sallāx.xāne/: [عربی/ فارسی] ☜ **کشتارگاه**

**سلاخی** / sallāxî/: [عربی] *اسم.* ١. گورێنی؛ پیشە و کاری گورێن ٢. *ـها*[مجازی] کوشتوبڕ؛ وێڕای ئەنجن‌ئەنجن‌کردن ‹زن و شوهر را توی خانه‌شان سلاخی کرده بودند: ژن و شووەکەیان لە ماڵ خۆیاندا ئەنجن‌ـ ئەنجن کردبوو›.

▣ **سلاخی کردن:** ئەنجن‌ئەنجن‌کردن؛ قەسفاندن؛ گووراندن؛ گوراندن؛ سەر بڕین و لەت‌وکوت‌کردنی کەلاکی گیاندار. هەروەها:

سلاخی شدن

**سلاست** / salāsat/: [عربی/اسم. /ادبی/ پاراوی؛ ڕەوانی؛ بێ‌گیر و گرفتی لە دەربڕینی وتار یان نووسراوەدا ‹سلاست بیان: پاراوی وتە›.

**سلاطین** / salātîn/: [عربی] جمعِ ☜ **سُلطان**

**سلاله** / solāle/: [عربی]/اسم. ١. بەرەباب؛ زارۆی هەڵکەوتوو ٢. بەرە؛ زازا؛ بنەوەچە؛ وەچوبەرە؛ چینی نوێ و تازەپێگەیشتوو.

**سلام** / salām ، ـها/: [عربی]/اسم. سەلام؛ سڵاو؛ سلام؛ سلاڤ: ١. شاگە؛ شەگە؛ شەگگە؛ وتەیێ کە لە سەرەتای دیمانە یان وت‌وویژ، لەگەڵ کەسێکدا دەگوترێ ٢. /اسلام/ ڕستەگەلێ کە نوێژخوێن لە ڕکاتی ئاخری نوێژدا دەیلێ ٣. ڕێورەسمێ کە ڕۆژانی جێژن لە خزمەت سەرۆکی ولاتدا دەیگێڕن ٤. ڕێورەسمێ کە بۆ کەسێکی خاوەن پێگەی بەرز جێبەجێی دەکەن و پتر دەگەڵ تەقاندنی تۆپدایە.

▣ سلام دادن: ١. سڵاوکردن؛ وتنی وشەی سەلام ‹بە مدیر سلام دادم: سەلامی بەرپرسم کرد›: **سلام کردن** ٢. سڵاو دانەوە؛ نوێژ تەواو کردن.

سلام رساندن/ فرستادن: سڵاو ناردن؛ سلام گەیاندن؛ سلام یاونەی/ یاونای.

سلام کردن ☜ **سلام دادن ـ ١**

سلام کسی را نگرفتن: /ادبی/ سڵاوی کەسێ نەسەندنەوە؛ وەڵام بە سەلامی کەسێ نەدانەوە؛ جواو سلام نەدانەوە ‹سلام دادم، سلامم را نگرفت، شاید نشنیده باشد: سڵاوم کرد، سڵاوەکەمی نەسەندەوە، ڕەنگە نەیبیستبێ›.

**سلامت**[1] / salāmat/: [عربی]/اسم. /ادبی/ تەندروستی؛ سەلامەت؛ ساخی؛ ساخ و سەلامەتی؛ سەرساغی؛ فەت؛ لەش‌ساغی؛ قەلب‌ساقی؛ ساقی؛ فراقەت ‹از سلامت کامل برخوردار است: تەندروستیەکی تەواوی هەیە›.

**سلامت**[2]: صفت. /گفتاری/ بێ‌وەی؛ سەلامەت: ١. خۆش؛ ساغ؛ ساق؛ ساخ؛ سەرساغ؛ وەسەتی؛ لەش‌ساق؛ تەندروست؛ چاک؛ باش؛ وەش ‹آزاد هم سلامت است: ئازادیش سەلامەتە› ٢. ساق؛ بەدەق؛ ساخ؛ بێ‌کەل‌وکوتەر؛ بێ‌کەم‌وکووڕی ‹این شیشه را همین‌طور سلامت به مقصد برسان!: ئەم شیشە، هەروا ساخ بگەیێنە بەرەوە!› ٣. دوور لە مەترسی؛ بێ‌خەتەر ‹این روزها سفر هوایی سلامت است: ئەم ڕۆژانە سەفەری هەوایی بێ‌وەیە›.

▣ به سلامت: بێ‌وەی؛ بە سلامەت؛ بە ساقی ‹آنها را به سلامت به مقصد رساند: بێ‌وەی گەیاندنیە بەرەوە›.

**سلامتی** / salāmatî/:(!)[عربی]/اسم. سەلامەت؛ سڵامەت؛ فەت؛ تەندروستی؛ ساقی؛ ساغی ‹سلامتی که باشد، بقیه‌ی چیزها درست می‌شود: سەلامەتی کە بێ، شتانی‌تر درووست دەبن›.

▣ به سلامتی: (!) بە سەلامەت؛ بە قەلب ساقی ‹به سلامتی فارغ شد: بە سەلامەت زا›.

**سلام‌علیک** / salām'aleyk/: [عربی] ☜ **سلام‌وعلیک**

**سلام‌علیکم** / salāmon'aleykom/: [عربی] دعا. سەلامون‌عەلەیکم؛ شاگە؛ شەگە؛ شەگگە؛ سلام؛ مەرحەبا؛ سڵاوتان لێ بێ؛ وتەیێکە لە کاتی سڵاوکردنا دەگوترێ.

**سلام‌وعلیک** / salām-o-'aleyk/: [عربی]/اسم. /مجازی/ چاک‌وچۆنی؛ ئاشنایەتی؛ ناسیاری ‹با هم مختصر سلام‌وعلیکی داشتیم: پێکەوە سووکە چاک‌وچۆنیەکمان هەبوو›.

**سلانه ـ سلانه** / sallāne-sallāne/: [ترکی] قید. /گفتاری/ هێدی‌ـهێدی؛ لۆژەلۆژ؛ نەرمەنەرم؛ شلەشل؛ گۆلەگۆل؛ سەبرـسەبر؛ قۆلەقۆل؛ تەکەتەک؛ لەقەلەق؛ کورکەکورک؛ نەرمەنەرم؛ هەڵتەک‌ـهەڵتەک؛ پاشەلەقە؛ ئارام و لە سەرخۆ ‹سلانه‌ـسلانه راه می‌رفت: هێدی ـ هێدی دەچوو›.

**سلب** / salb/: [عربی]/اسم. /ادبی/ بێوەری؛ بێ‌بەری؛ کار و ڕەوتی بێ‌بەش‌کردن؛ ڕێگە

لێ‌گرتن؛ لێ‌سەندن؛ لێ‌داماڵین؛ لێ‌کەندن.

▣ **سلب اختیار:** دۆخ یان ڕەوتی دەسەڵات لێ سەندن؛ سەربەستی بۆ نەهێشتن. هەروەها: **سلب قدرت؛ سلب حیثیت**

▣ **سلب کردن:** لێ‌گرتنەوە؛ لێ‌سەندنەوە؛ بێوەری کردن؛ بێ‌بەش‌کردن ‹همەی اختیارات او را سلب کردند: هەموو دەسەڵاتەکانیان لێ‌سەندەوە›. هەروەها: **سلب شدن**

**سلبی** / salbî/: [عربی] *صفت.* نەرێنی؛ بە دۆخ یان شێوەی وەرنەگەڕانەوە. بەرانبەر: **ایجابی**

**سلتی** / seltî/: *اسم.* سلتی؛ لقێک لە زمانگەلی هیندو- ئوروپایی، وەک زمانگەلی سکاتلەندی، ئیرلەندی و بریتونی.

**سلحشور** / salahšûr ، ـان/: [از عربی/ فارسی] *صفت. [ادبی]* شەڕڤان؛ شەروان؛ چەکرێژ؛ پڕچەک؛ چارچەک؛ چەکداری ساز و تەیار لە شەڕدا. هەروەها: **سلحشوری**

**سلخ** / salx/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ١. سەلخ؛ دوایین ڕۆژی مانگی قەمەری ٢. گور؛ گرژ؛ کار یان ڕەوتی پێست‌گرتنەوە.

▣ **سلخ کردن:** ١. گووراندن؛ گوورین؛ گوراندن؛ گرژاندن؛ کەڤلاندن؛ قەڵخ‌کردن؛ پێست داماڵین؛ پێست گرتنەوە ٢. هەڵکەندن؛ هەڵقەندن؛ هۆرکەنتەی؛ دەرکێشانی گیا دە زەویدا ٣. *[مجازی]* دەرهێنان؛ داکەندن؛ داماڵین؛ ڕووت‌کردنەوە؛ وەتەی؛ بەرئاردەی.

**سلسله** / selsele ، ـها/: [عربی] *اسم.* زنجیرە: ١. ریز؛ رزن؛ ڕاف: *الف)* رزدە؛ ڕزدی؛ ڕزد؛ سەفان؛ کەژ و کۆی لەشوێن‌یەک ‹سلسله کوههای زاگرس: زنجیرەچیای زاگرۆس› *ب)* کژورەک؛ خێزەرە؛ ڕێچکە ‹یک سلسله مورچه به دور لاشەی سوسکی می‌چرخیدند: ریزێک میروولە بە دەوری لاشەی قالۆنچەیەکدا دەسووڕانەوە› *پ)* ڕستە؛ ڕێسە؛ ریس؛ گەڵوازە؛ تاقمێک شتی لە شوێن یەک‌خراو ‹سلسله کتابهای آموزشی: زنجیرە کتێبی فێرکاری› ٢. سان؛ کەسانێک لە بنەماڵەیەکدا کە یەک لە دوای یەک پاشایەتی دەگرنە دەستەوە ‹سلسلەی پادشاهی: زنجیرەی پاتشایی› ٣. دەستەیەک کە یەک بە شوێن یەک دەبنە ڕێبەر و پێشەوای چینێک ‹سلسلەی دراویش: زنجیرەی دەروێشان› ٤. *[زیست‌شناسی]* هەر یەکە لە سێ دەستەی سەرەکی دابەشی بوونەوەران (کرەکان، ڕوەکان و گیانەوەران) کە نێو خۆشیاندا زۆر لق و پۆ دەبێتەوە.

**سلسله‌جنبان** / selselecombān, -conbān/: [عربی/ فارسی] *اسم. [مجازی، ادبی]* بزوێنەر؛ پاڵ‌پێوەنەر؛ دەڵەکەدەر؛ ڕاژێنەر؛ دنەدەر؛ هاندەر؛ هەڵخڕێنەر؛ هۆکاری هەڵنانی دیتران بۆ کردنی کارێ ‹همت اگر سلسله‌جنبان شود/ مور تواند که سلیمان شود: هیممەت ئەگەر بزوێنەر بێ/ تنۆکێک دەشێ گەوهەر بێ›.

**سلسله مراتب** / selselemarāteb/: [عربی] *اسم.* زنجیرە پلەوپایە؛ پێوەندی نێوان ئەندامانی دامەزراوەیەک بە شێوەی یەک لە سەر و یەک لە خوار تا بان.

**سلسیوس** / selsiyûs/: [؟] ☜ درجەی صد بخشی، **درجه**

**سلطان** / soltān ، ـها؛ سلاطین/: [عربی] *اسم.* سوڵتان؛ سڵتان؛ سان؛ پاتشا ‹سلطان عثمانی: سوڵتانی عوسمانی›.

**سلطانی** / soltānî/: [عربی] *صفت.* ١. پاشایی؛ پادشایی؛ سانی؛ پێوەندیدار یان سەر بە سوڵتان ٢. ☜ چلوکباب سلطانی، **چلوکباب** ٣. ☜ قطع سلطانی، **قطع**

**سلطنت** / saltanat/: [عربی] *اسم.* سەڵتەنەت؛ پاشایی؛ شایەتی ‹نادرشاه در سال ١١٤٨ (هـ. ق) به سلطنت رسید: نادرشا لە ساڵی ١١٤٨ی (ک. م.) گەیشتە سەڵتەنەت›.

▣ **سلطنت فردی:** حکومت مطلقه ☜ **حکومت**

▣ **سلطنت داشتن:** شا بوون؛ پادشا بوون؛ لە سەر

تەخت بـوون ‹محمدرضا شاه ۳۷ سال سلطنت داشت: حەمەڕەزا شا ۳۷ ساڵ شا بوو›.
**سلطنت کردن**: پاشایەتی کردن؛ شـایی کـردن؛ حوکوومەت کردن ‹کریم‌خان بـر بخشی از ایـران سلطنت می‌کرد: کـەریم‌خـان بـە سـەر بەشـێ لـە ئێراندا پاشایەتی دەکرد›.
**به سلطنت رسیدن**: بوون بـە پاشـا؛ بوونـە شـا؛ چوونە سەر تەختی پاشایی.
**سلطنت‌طلب** / saltanat.talab، ـها؛ ـان/: [عربـی] /اسم. شادۆس؛ پاشـاخواز ‹نیروهـای سـلطنت‌طلـب: هێزە شادوسەکان›.
**سـلطنتی** / saltanatî/: [عربـی] صـفت. پادشـایی؛ پاتشایی؛ پاوشایی؛ پاشایی: ۱. سەر بە پادشـایی ‹خانوادەی سلطنتی: بنەماڵەی پادشایی› ۲. *[مجازی]* شکۆدار ‹ماشین سلطنتی: ماشێنی پانشایی›.
**سـلطه** / solte/: [عربـی] /اسـم. کـەلێژ؛ زاڵـی؛ دەسەڵات؛ دەسەڵاتداری؛ دەستداری؛ زووخـی؛ چیری؛ چێری؛ توانایی چێر بوون بە سەر کەسێ یان شتێکدا و بەڕێوەبردنی.
▣ **سلطه داشتن**: زاڵ بوون؛ بە دەسـەڵات بـوون؛ دەس ڕۆیشتن؛ دەسەڵات هەبوون ‹او بە شوهر و فرزنـدانش سـلطه داشـت: ئـەو بـە سـەر مێـرد و منداڵەکانیدا زاڵ بوو›.
**سلطه یافتن**: زاڵ بوون؛ چیر بـوون؛ دەسـەڵات سـەندن ‹بـزودی بـر همـەی کارهـا سـلطه یافـت: زووبەزوو بە سەر گشت کارەکاندا زاڵ بوو›.
**سـلطه‌پـذیر** / soltepazîr، ـان/: [عربی/ فارسـی] صفت. کۆڵدەر؛ ئامادە و بارهاتوو بـۆ چوونـە ژێـر باری دەسەڵات؛ بەرامبـەر: **سلطه‌جو**. هـەروەها: **سلطه‌پذیری**
**سلطه‌جو** / soltecû، ـیان/: [عربی/ فارسی] صـفت. دەسەڵاتخـواز؛ خوازیـاری زاڵ بـوون بـە سـەر خەڵک و سەرخستنی ویـستی خـۆ؛ بەرامبـەر: **سلطه‌پذیر**. هەروەها: **سلطه‌جویی**
**سـلطه‌طـلب** / soltetalab، ـان/: [عربـی] صـفت. دەسەڵات‌خواز. هەروەها: **سلطه‌طلبی**
**سلطه‌گر** / soltegar، ـان/: [عربی/ فارسـی] صـفت. دەسدرێژکەر؛ لەهێنەر ‹دولتهای سلطه‌گر: دەوڵەتە دەسدرێژکەرەکان›.
**سـلف** / salaf، اسلاف/: [عربـی] صـفت. *[گفتـاری]* پێشین؛ پێشوو؛ ڕابـردوو؛ هـی دەورانی ڕابـردوو ‹پادشاهان سلف: پاشایانی پێشوو›.
**سلف** / self، ـها/: [از عربی] /اسم. *[گفتـاری]* سـڵپ؛ سلپە.
**سلف‌خر** / salafxar، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. سەوزخڕ؛ سەلەمسێن؛ سـەلەم‌کـار؛ کەسـێ کـە کالایـەک پـێش بەرهـەم هـاتنی دەسـێنێ و پارەکەشی دەدا.
**سـلف‌خـری** / salafxarî/: [عربـی/ فارسـی] /اسـم. سەوزخڕی؛ سەلەمسێنی؛ کار یان ڕەوتی کڕینی کالا لە جووتیار پێش لە بەرهەم‌هاتنی.
**سلفدان** / selfdān، ـهـا/: [از عربی/ فارسـی] /اسـم. *[گفتاری]* سڵپدان؛ تـڵفدان؛ جـێ تـڵفی؛ دەفـری تێکردنی سڵپ و تڵف و هەموو جۆرە خڵتێک.
**سلفژ** / solfej/: [فرانسوی] /اسم. *[موسیقی]* سـولفیژ؛ شێوازێک بۆ ئامادەکردنی چاو و گوێ تا قوتـابی مووسیقا بتوانێ هەموو نوتی گورانیەک لە کـاتی بەڕێوەچووندا ناوببا.
**سلف‌سرویس** / selfservîs، ـها/: [فرانسوی] /اسم. سیلف‌سرویس؛ ڕستوورانێ کە کـڕیار بـۆ خـۆی خواردن هەڵدەبژێرێ و دەیباتە سەر مێزەکەی.
**سلفیدن** / solfîdan, selfîdan/: [؟] مصدر. متعدی. *[گفتـاری]* // **سـلفیدی**: داتجرتانـد؛ **مـی‌سـلفی**: دادەجرتێنی؛ **بسلف**: داجرتنە// داجرتاندن؛ بـە زۆر و لە ناچاری پارە دان ‹دیشب رفتیم رستوران، دەهزار تومـان سـلفیدیم: دوێـشەو چووینـە ڕسـتۆران، دەهەزارتەنمان داجرتاند›.
■ صفت مفعولی: **سلفیده** (داجرتـاو)/ مـصدر منفـی: **نسلفیدن** (دانەجرتاندن)
**سلق** / selq/: [عربی] /اسم. سڵق؛ زڵـق؛ گیایـەکی

گەلاپانە لە چۆنەر دەکا و گەلاکەی بۆ چێشت دەشێ.

**سلک** / selk/: [عربی]/اسم. ١. [نامتداول] ڕیس؛ ڕێسە؛ دەزوو؛ دەزی؛ مەچیر؛ تاڵ؛ بەن ٢. ڕیز؛ ڕاڤ؛ پێڕ؛ ڕزن؛ سەر؛ سان ‹در سلک غافلین درآمد: چووە ڕیزی گێل‌حۆلانەوە›.

**سلمانی** / salmānî ، ـها/: [عربی]/اسم. [گفتاری] ١. سەرتاش؛ دەلاک؛ بەربەر ‹سلمانی سقزی بود: دەلاکەکە سەقزی بوو› ٢. دەلاکی؛ سەرتاشخانە؛ سەلمانی ‹موهایت بلند شده، برو سلمانی: قژت زۆر بووە، بچۆ بۆ دەلاکی›.

**سلمه‌تره** / salmetare ، ـها/:اسم. تەڕەسێمانە؛ تەڕەسرێمانە؛ سلێمان‌تەڕە؛ سەلمۆکە؛ سەلمکە؛ سەلێمکی؛ سلێمانکە؛ گیایەکی ئالیکی بە لاسکی لووس، لق و گەلای بەرانبەر یەک و گوڵی نێرماوە، هەموو ئەندامانی ئەم گیایە بۆ دەرمان دەشێن.

**سلندر** / salandar/: صفت. [گفتاری] تەیا؛ سەرلێ‌شێواو؛ سەرگەردان؛ وێڵ؛ وەیلان؛ ترافیە؛ تێماو ‹آزاد رفت و من سفیل و سلندر ماندم وسط خیابان: ئازاد دای لێ ڕۆی و من تەیا و تەنیا لە چەقی شەقامەکەدا مامەوە›.

**سلنوئید** / soleno'îd ، ـها/: [؟]/اسم. سیم‌پێچ؛ تەلپێچ: **سۆلنوئید**

**سلنیم** / selenyom/: [فرانسوی]/اسم. سلنیوم؛ توخمی کیمیاوی ناکانزا، بە ژمارەی ئەتومی ٣٤، کێشی ئەتومی ٧٨,٩٦ و بە ڕواڵەتێکی کانزایی و بە ڕەنگی خۆڵەمێشی کە لە ئاودا ناتوێتەوە.

**سلو** / solo ، ـها/: [ایتالیایی]/اسم. [موسیقی] سۆلۆ: ١. تاکەژەنی ٢. تاکەچڕی؛ تاکەخوێنی * **سۆلو**

**سلوفان** / solofān ، ـها/: [انگلیسی/ فرانسوی]/اسم. دەلق؛ دەڵق؛ سولوفان؛ کاغەزێکی ڕوون (وەک شیشە) لە جنسی سلولزی بووژاوە کە بۆ بەستەبەنی و بەرگ‌سازی کتێب بەکاردێت.

**سلوک** / sulûk, solûk/: [عربی]/اسم. ١. [ادبی] ڕەوشت؛ ڕەوێڵ؛ کردار؛ زێ؛ هەڵس‌وکەوت؛ ڕەوت و ڕەوشت ‹حُسن سلوک: جوانی ڕەوشت› ٢. [گفتاری] ئاکارباشی؛ ڕووخۆشی؛ ڕەوش‌باشی؛ ڕەوت و ڕەوشت جوانی.

◘ **سلوک کردن**: ڕووخۆش بوون؛ هەڵس‌وکەوتی باش‌کردن ‹با هم سلوک کنید! نگذارید سر و صدا بلند شود: پێکەوە ڕووخوش بن! مەهێڵن بێتە زڵە›.

**سلول** / sellûl ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. سیلوول؛ چاوە: ١. خان؛ خانە؛ خانک؛ خانۆک ‹سلول گیاهی: خانی گیایی› ٢. [نامتداول] حوجرە؛ جێگا یان خانووکەی بچووک ٣. ژووری تاکەکەسی بۆ بەندی.

◘ **سلول تخم**: [زیست‌شناسی] زیگوت؛ خانی هێلکە.

**سلولز** / sellûloz/: [فرانسوی]/اسم. سیلوولوز؛ ماکی سەرەکی پێکهێنەری دیوارەی خانگەلی گیایی کە لە هیدراتگەلی کەربون دروست بووە: **سلۆلۆز**

**سلولوئید** / sellûlo'îd/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] سیللولۆئید؛ ماکی بەرهەم‌هاتوو لە لێکدراوی نیتراتی سیلوولوز لەگەڵ کافووردا، کە زۆر زوو گڕ دەگرێ و لە چێ‌کردنی بڕێ کالا، کەرەسەی ددانبژیشکی و برینکاریدا بەکاردێ.

**سلولوز** / sellûloz/: [فرانسوی] ☜ **سلولز**

**سلولی** / sellûlî/: [فرانسوی] صفت. سیللوولی؛ چاوەیی؛ خانی؛ خانۆکەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە سیلوول ‹زیست‌شناسی سلولی: ژیانی سیللولی›.

**سله** / salle, selle/:اسم. ١. /ـها/ [عربی] قەرتاڵە؛ زەمبیل؛ زەمیلە؛ تریان؛ دەسەچین؛ دەرچین؛ گۆشەر؛ قەوشەر؛ تەیکە؛ تەیجە؛ تلۆخ؛ سەبەتە؛ سەوەتە؛ سەلک ٢. تورکە؛ توورکە؛ دڕەهی؛ لمەشکە؛ تۆژاڵێ لە قوڕ و لیتە کە دوای باران یا ئاو بە سەر زەویەوە دەمێنیتەوە و بە هۆی ئیشک بوونەوە، سفت دەبێتەوە و دەقەڵشێ

۳. پەترۆ؛ پەترۆخە؛ پەترۆک؛ پەترۆکە؛ پەتروو؛ پترۆک؛ پترۆخە؛ پوولەکە؛ کەپرۆکە؛ کەپرە؛ کەمێڵ؛ کەمێلە؛ قاشگ؛ قەتماخە؛ قرتماخە؛ قرتماغە؛ قرماغ؛ بزماتە؛ بزمەتە؛ توێژێ ڕەق و سفت کە لە ڕەوتی چابوونەوەی برینـدا بە سەریەوە دەگرسێ، دواتر خۆی لا دەچێ.

⊡ **سله بستن:** پەترۆ بەستن؛ کەپرۆکە بەستن؛ پەترۆکە بەستن/ بینای؛ قەتماخە/ قرتماخە بەستن ‹زخم سله بسته است: زامەکە پەتروی بەستووە›.

**سله شکستن:** درز کوێرکردنەوە؛ کوتان و نەرم کردنەوەی زەوی قەڵشاو ‹سله شکستن جوی مزرعه ضروری است: درز کوێر کردنەوەی جۆگەی کێڵگەکە پێویستە›.

**سلیس** / salîs/: [از عربی] *صفت. [ادبی]* ڕەوان؛ پاراو؛ بێ‌گرێ ‹نثر سلیس: پەخشانی ڕەوان›.

**سلیست** / solîst ، ـها/: [فرانسوی] *اسم. [موسیقی]* سۆلیست: ۱. تاکەژەن ۲. تاکەچڕ؛ تاکەخوێن؛ گۆرانی‌بێژێ کە بە تەنیایی گۆرانی دەخوێنێ ❋ **سولیست**

**سلیطه** / salîte ، ـها/: [عربی] *صفت.* دەراشۆ؛ تلۆخ؛ هەیشۆ؛ سووزانی؛ سووزمانی؛ سۆزمانی؛ سازندە؛ سازنە؛ دەلیقانی؛ قرمێچە؛ سەلیتە؛ کەڵتە؛ زوان‌درێژ؛ چەقوودەم؛ خاوەن دەسەڵات بە سەر خەڵک، بەتایبەت شوو و خزم و کەسانی خۆدا، بە هۆی بێ‌شەرمی و زمان‌درێژییەوە (بۆ ژنان دەگوترێ) ‹زن سلیطه: ژنی دەراشو›.

**سلیقه** / salîqe ، ـها؛ سلایق/: [عربی] *اسم.* سەرڕێژنە؛ سەلیقە: ۱. دڵخواز و پەسندی تاکە کەسی ۲. مشوور؛ لێهاتوویی برستی زەینی و هەستی کەس بۆ جیاکردنەوەی جوانی یان باشی ‹خواهرم خیلی باسلیقه است: خوشکم گەلەک بەمشوورە›.

**سلیقه‌دار** / salîqedār/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بەمشوور؛ سەرڕێژنەدار؛ بەسەلیقە.

**سلیم**[1] / salîm ، ـها/: [؟] *اسم.* پەلەوەری کۆچەری زرێباری، بە باڵی درێژ و دەندووکی تیژ، فڕینی بەهێز و ڕاکردنی توند و تیژەوە: **مرغ باران**

**سلیم**[2]: [عربی] *صفت.* ۱. دروستکار؛ کارڕاست ۲. بێ‌خەوش؛ پاک؛ فەتات ۳. بێ‌ئازار؛ مەند؛ هێدی؛ هێمن.

**سلیم‌النفس** / salîmonnafs/: [عربی] *صفت.* گیان‌پاک؛ کارچاک؛ پیاوچاک؛ مێرخاس.

**سم** / sam(m) ، ـها؛ سموم/: [عربی] *اسم.* ژار؛ زار؛ زل؛ ژاڵ؛ زەهر؛ ژەهر؛ ژەر؛ ژەحر؛ ژاعر؛ جەحر؛ ژەقنەمووت؛ سەم: ۱. ماکێ کە بە هۆی کاردانەوەی کیمیاوی، وەزەنی بۆ گیانداران هەیە ۲. دەرمانی تەشەکوژ لە کشت و کاڵدا ۳. *[کنایی]* هەر شتێکی زیاندەر ‹سیگار برای تو سم است: جگەرە بۆ تۆ ژەهرە›.

**سم** / som ، ـها/: *اسم.* سم؛ سوم؛ چم؛ پۆشەنی ڕەق و شاخی لە پەلی برێ چوارپێدا.

**سماجت** / semācat, samācet ، ـها/: [عربی] *اسم.* سامنجی؛ پێچەقێنی؛ پاداگەزی؛ پێداگری؛ کوت؛ چۆنیەتی ڕەقاندنەوە؛ سوور بوون؛ سمڕ بوون؛ خڕ وە خڕ بڕین ‹خیلی سماجت کردم تا همراهم بیاید: زۆر سامنجیم کرد تا بێ لەتەکما›.

**سماع** / samā', semā'/: [عربی] *اسم. [قدیمی]* هەلەکا؛ هەلکە؛ ئورزان؛ جەزمە؛ حاڵ؛ سەمای دەروێشان.

**سماق** / somāq ، ـها/: [معرب از فارسی] *اسم.* سماق؛ سماقی؛ سماخ؛ سوماخ؛ سپووک؛ سڤۆک؛ سڤووک؛ سفووک؛ شۆک؛ توتوم؛ تووتووم؛ توتم؛ تەتەری؛ تمتم؛ تومتم؛ ترش: ۱. دارچکێکی گچکە، بە لق‌وپۆی کورکداری خۆڵەمێشی کە لە وەرزی پاییزدا گەڵاکانی سوور دەبن ۲. دەنکی ترشی گیای سماق بە تۆزی سوورەوە، کە هێشووئاسایە و هاڕدراوە پاک‌کراوەکەی بۆ دەرمان و چێژ بەکاردێ.

⊡ **سماق مکیدن:** *[تعریض]* پا لە پەیین/ پەین دان؛ ماتڵ بوون؛ چاوەڕوانی بێهۆکێشان ‹فعلاً باید سماق بمکی: جارێ دەبێ پا لە پەیین بدەی!›.

**سماق‌پالا** / somāqpālā ، ـها/: [معرب/ فارسی] *اسم.* نانەشان؛ تەینجە؛ ئاوکێش؛ سماق‌پالان؛ ئاشپاڵوو؛ سرلە؛ سووزمە؛ دەفری تەشت‌ئاسای لە چڵی بی یان ئەرخەوان چێ‌کراو بۆ ئاوکێش کردن یان پالاوتن.

**سماک** / semāk/: [عربی] *اسم.* *[نجوم]* ناوی دوو ئەستێرەی ڕووناک لە دوو کەلووی ئاسمانیدا.

⊡ **سماک اَعزَل:** ڕووناکترین ئەستێرەی کەلووی هێشوو.

**سماک رامِح:** ئەستێرەیێکی پرشنگدارە لە کەلووی عەوادا.

**سمانتیت** / semāntît/: [؟] *اسم.* *[صنعت]* سمانتیت؛ کاربیدی ئاسن؛ کەربووی ئاسنی ڕەق و تورت کە لە پێکهاتەی چودەن و پۆلادا هەیە.

**سمانتیک** / semāntîk/: [فرانسوی] *اسم.* واتاناسی؛ ماناناسی.

**سماوات** / samāvāt/: [عربی] *اسم.* ئاسمانگەل؛ ئاسمانان؛ ئاسمانێ.

**سماور** / samāvar ، ـها/: [روسی] *اسم.* سەماوەر؛ چاپەز؛ چالێن؛ کەرەستەیەکی کانزایی بۆ وەکوڵ هێنانی ئاو و دەم کردنی چایی.

**سماورساز** / samāvarsāz ، ـها؛ ـان/: [روسی/ فارسی] *اسم.* سەماوەرساز: ١. چێکری سەماوەر ٢. چاکەوکری سەماوەر. هەروەها: **سماورسازی**

**سماوی** / samāvî/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* ئاسمانی ‹اجرام سماوی: تەنگەلی ئاسمانی›.

**سمباده** / sombāde ☜ **سُنباده**

**سمبل** / sambal, sanbal/: *اسم.* پۆخڵەوات؛ تەتەپەخێ؛ هاکۆ؛ هەیکۆ؛ شپرزەکاری؛ کارێ کە بەبێ سەرنج و وردەکاری جێبەجێ کرابێ: **سَنبَل**

⊡ **سمبل کردن:** پۆخڵە/ هاکۆی/ تەتەپەخێ/ شپرزەکاری کردن؛ کاری سەرشکێن و سەرچڵی‌کردن؛ بێ‌سەرنج کارکردن ‹او هر کاری را سمبل می‌کرد: هەموو کارێکی پۆخڵە دەکرد›.

**سمبل** / sambol/: [فرانسوی] ☜ **سَمبُول**

**سمبل** / sombol/ ☜ **سُنبُل**

**سمبل‌کاری** / sambalkārî, sanbal-/: *اسم.* پوخڵەکاری؛ هاکۆکاری؛ هەیکۆکاری؛ پوخڵەوات؛ شپرزەکاری؛ کردنی کارێک بە سەرسەری، بێ‌سەرنجدان و وردبوونەوە ‹برخی صنعتگران ما سمبل‌کاری می‌کنند وآبروی صنعت را می‌برند: برێ لە پیشەکارانمان پوخلەکاری دەکەن و ئابڕووی پیشەسازیش دەبەن›.

**سمبول** / sambol ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* نیشانە؛ نوێنە؛ نمانا؛ نموودە: **سَمبُل**

**سمبولیست** / sambolîst ، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* نماناواز؛ نیشانەخواز؛ نماناگر؛ نموودەخواز ‹شاعر سمبولیست: شاعیری نماناواز›.

**سمبولیسم** / sambolîsm/: [فرانسوی] *اسم.* نماناوازی؛ نیشانەخوازی.

**سمبولیک** / sambolîk/: [فرانسوی] *صفت.* نمانایی؛ نوێنەیی؛ نیشانەیی ‹شعر سمبولیک: شیعری نمانایی›.

**سمبه** / sombe/ ☜ **سُنبه**

**سمپات** / sampāt ، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* *[گفتاری]* لایەنگر؛ هۆگر؛ هەوادار؛ دڵبەستە، بەتایبەت ئی گرۆیەکی سیاسی: **سمپاتیزان**

**سمپاتی** / sampātî/: [فرانسوی] *اسم.* ١. لایەنگری؛ هۆگری ‹عده‌ای نسبت به او سمپاتی داشتند: برێک هۆگریان پێ هەبوو› ٢. *[نامتداول]* هاودەردی.

**سمپاتیزان** / sampātîzān/: [فرانسوی] ☜ **سَمپات**

**سمپاتیک** / sampātîk/: [فرانسوی] *صفت.*

دڵخواز؛ بەردڵ؛ دڵگر ‹قیافەی سمپاتیک: نژمی دڵخواز›.

**سمپاش** / sampāš ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ١. سەمپژێن؛ سەمپژ؛ کەرستەیەکی دەستی یان موتۆری کە سەمی دژی تەشە و مێملّ بە هەوای پاڵەپەستراو وەک تۆز دەپژێنێ ٢. سەمڕێژ؛ کرێکارێ کە کاری سەمپژێنی دەکا.

**سمپاشی** / sampāšî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. سەمپژێنی: ١. کار و ڕەوتی پژاندنی دەرمانی ژاری بۆ تێدا بردنی گیاندارانی زیانەخرۆ ٢./کنایی/ سەر شێواندن لە خەڵک بە درۆ و دەلەسە.

**سمپوزیوم** / sampoz(i)yom ، ـها/: [فرانسوی] /اسم. کۆبوونەوە: ١. کۆڕی فەرمی گرۆیەک لە سەردەرچوان و کارزانان بۆ دەربڕینی بیر و ڕا یان دانی زانیاری بە بەشدارانی نێو کۆڕەکە ٢. شوێنی بەڕێوە چوونی ئاوا کۆڕێک.

**سمت** / samt ، ـها/: [عربی]/اسم. لا؛ لایەن؛ ڕەهەند؛ ئالی؛ سۆ؛ بەرەوگە؛ ڕبات.

▣ سمت راست: لای ڕاست؛ ئالی ڕاس؛ دەس ڕاس. هەروەها: **سمت چپ**

**سمت** / semat ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. پلە؛ پایە ‹در آن اداره سمت خوبی داشت: لەو مەزرینگەیەدا پلەیەکی باشی هەبوو› ٢. کار؛ پیشە ٣. نیشان؛ شوێن؛ جێگای بەجێماو لە شتێک.

**سم‌تراش** / somtarāš ، ـها/:/اسم. سمگر؛ سمتراش؛ سم‌تاش؛ سمارتە؛ ئامرازێکە ناڵبەندان سمی یەکسمانی پێدەتاشن.

**سمتگیری** / samtgîrî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. لاگری؛ لابژێری؛ ڕێبژێری؛ کار و ڕەوتی داگرتنەبەر؛ بڕیار دان بۆ ڕۆیین بەرەو لایەک.

**سمج** / semec ، ـها/: [عربی] صفت. سمڕ؛ سوور؛ پێداگر؛ سامنج؛ سمنج؛ پێچەقێن؛ مکوڕ؛ ڕەچوکار؛ دیڤەلان؛ دوڤ‌دوڤک؛ دیڤەلانک؛ بە گێرە و سەرسەخت؛ هۆکارە بە پادانەگەز و ڕەقاندنەوەی زۆر و نابەجێ ‹گدای سمج: پارسەکی سمڕ›.

**سمچال** / somčāl ، ـها/:/اسم. جێ‌سم؛ سمچاڵ؛ چاڵی شوێن سمی چوارپێیان.

**سمدار** / somdār ، ـان /: صفت. سمدار؛ بە سم (لە جێی نینۆک) لە دوابەشی ئەندامی ڕۆیین (وەک ئەسپ، گا و مەڕ).

**سمرو** / somrow/: صفت. سمڕۆ؛ سمڕەو؛ بە تایبەتمەندی ڕێگە چوون بە سەر سمەوە (وەک ئەسپ و گا و ...).

**سمسار** / semsār ، ـها؛ ـان/: [معرب از سنسکریت] /اسم. ناڤبێژ؛ ناڤچیت؛ سمسار؛ سمسێر؛ کۆنەفرۆش؛ کەسێ کە کەل‌وپەلی دەکار کراوی ماڵ دان‌وسان دەکا.

**سمساری** / semsārî/: [معرب]/اسم. سمساری: ١. کاری ناڤبێژ ٢. /ـها/ دووکان دەسەدوو؛ شوێنێ کە کەل‌وپەلی دەستەدووی تێدا دان‌وسان دەکرێ.

**سم‌شناسی** / samšenāsî/: [عربی/ فارسی] ☜ **زهرشناسی**

**سمع** / sam'/: [عربی]/اسم. /ادبی/ ژنەوایی؛ بیسایی.

▣ **بە سمع کسی رساندن:** گەیاندنە گوێی کەسێک؛ بە گوێ کەسێک‌گەیاندن ‹لازم است اعتراض ما به سمع مقامات مسئول برسد: پێویستە بەرتەکی ئێمە بگاتە گوێی لێپرسراوان›.

**سمعک** / sam'ak ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. بیستۆک؛ بیستۆکە؛ بیستەک؛ ئامرازێکی ئەلکترۆنیکی کە دەنگ بەهێزتر دەکا و ئەنجا وەبەر گوێی دەخا تا باشتر ببیسرێ.

**سمعی** / sam'î/: [عربی] صفت. ١. گوێیی؛ گوێچکەیی ٢. بیستنی؛ ژنەفتنی؛ شنەفتنی.

**سمعی ـ بصری** / sam'îbasarî/: [عربی] ☜ **سمعی‌وبصری**

**سمعی وبصری** / sam'î-yo-basarî /: [عربی]/اسم. فێرکاری لە ڕێگەی بیستن و دیتنەوە.

**سمفنی** / samfonî, sanfonî /: [فرانسوی] ـها/: اسم. سەمفونی؛ کۆمژەن؛ مووسیقایەکی سازی درێژخایەن لە چوار بەشدا کە لە لایەن ئورکسترێکی تەواوەوە دەژەنرێ: **سمفُونی؛ سنفُنی؛ سنفُونی**

**سمفنیک** / samfonîk, sanfonîk /: [فرانسوی] صفت. سەمفونیک؛ سەر بە سەمفونی: **سمفُونیک؛ سنفُنیک؛ سنفُونیک**

**سمفونی** / samfonî /: [فرانسوی] ☜ **سَمفُنی**

**سمفونیک** / samfonîk /: [فرانسوی] ☜ **سَمفُنیک**

**سمنامبولیسم** / somnāmbolîsm /: [؟]/اسم. [روان‌شناسی] خەورۆیی؛ کار یان ڕەوتی ڕێگا ڕۆیشتن بەدەم خەوەوە.

**سمنت** / sement /: [انگلیسی]/اسم. سمنت؛ چیمەنتۆ؛ سیمان.

**سمنتی** / sementî /: [انگلیسی] صفت. سیمانی؛ سمنتی؛ چیمەنتۆیی.

**سمند** / samand /: اسم. [ادبی] سەمەن؛ ئەسپی زەرد.

**سمندر** / samandar ، ـها؛ ـان /: [یونانی]/اسم. ۱. خەجخەجۆک؛ خەجۆکە؛ کەشکەسەرە؛ کەشکەسەر؛ گیانەوەری وشکاوی مارمێلکئاسا، بە جەستە و جووچکی درێژ و دەست و پێی کورتەوە کە لە تیشکی ڕاستەوخۆ خۆی لادەدا ۲. [قدیمی] گیانەوەرێکی ئەفسانەیی کە بە بڕوای پێشینان لە ئاگردا دەژیا.

▣ **سمندر آبی**: قورناویلکە؛ گیاندارێکی دووژی وەک بۆق وایە و هێواش دەجوولێ و لەشی لاکێشەیە، بە شەو ڕەنگی ڕەشە و پەڵەی زەردی تێدایە، کرم و مێروو دەخوا و لە زستاندا خۆی مت دەکا.

**سمنو** / samanû /: اسم. سەمەنی؛ خواردەمەنیەکی شیرنە کە لە شیرەی گەنمە فەریکە و ئارد سازی دەکەن و زۆر جاریش لە سفرەی حەوت‌سین دادەنرێ.

**سمنوپزان** / samanûpazān /: اسم. ڕێورەسمێکی کۆنە بۆ لێنانی سەمەنوو کە ژنان بەڕێوەی دەبەن.

**سمنه** / somne /: اسم. پەیکول؛ پەیکولە؛ تووژەکەشوانە؛ گیایێکی دڕکاویە بە گولێکی سپیەوە.

**سمور** / samûr ، ـها؛ ـان /: اسم. سمۆر؛ سمۆرە؛ سڤۆر؛ سفۆر؛ سڤۆرە؛ سەڤۆری؛ سمۆلەک؛ سەفۆری؛ سەڤوری؛ سەفۆرە؛ سەڤوری؛ گوهاندارێکی گۆشتخۆری وەک پشیلەیە بە جەستەیەکی گچکەی باریک و کێشراو و پێی کورتەوە کەوڵی نەرم و تووکی خورمایی یان ڕەش و خۆڵەمێشیە.

▣ **سمور آبی** ☜ **شِنگ رودخانه**

**سمور رودخانه** ☜ **شِنگ رودخانه**

**سموم** / samûm /: [عربی]/اسم. باد سام ☜ **باد**

**سموم** / somûm, sumûm /: [عربی] جمعِ ☜ **سَم**

**سمی** / sammî ، ـها /: [عربی] صفت. ۱. زەهردار؛ ژەهرین؛ ژاراوی؛ ژەهراوی؛ زەهراوی؛ ژاردار؛ ژەهردار ۲. ماکی ژاراوی؛ مەسمووم‌کەر.

**سمیت** / samîyyat /: [عربی]/اسم. ژارێتی؛ سەمێتی؛ بار یان دۆخی ژەهری بوون ‹سمیت آن بسیار زیاد است و به مرگ شخص منجر می‌شود: ژارێتیەکەی یەکجار زۆرە و دەبێتە هۆی مردن›.

**سمین** / samîn /: [عربی] صفت. [ادبی] قەڵەو؛ قەلەو؛ قەرەو؛ چاخ؛ گۆشتن؛ تنەگۆشت؛ خاوەن لەشی لە ڕادەی ئاسایی گەورەتری تەژی لە گۆشت و چەوری.

**سمینار** / semînār ، ـها /: [انگلیسی از آلمانی]/اسم. سمینار: ۱. زنجیرەوتارگەلێ کە لە لایەن شارەزایانەوە سەبارەت بە بابەتێکی دیاریکراو

پێشکەش دەکرێ ٢. کۆڕێ کە ئەو وتانەی تێدا دەخوێنرێتەوە.

**سـن** / sen ، ـهـا/:/اسـم. ١. [فرانـسوی] شـانۆ ‹هنرپیشه‌ها آمدند روی سن: شـانۆیاران هاتنـە سـەر شانۆ› ٢. سوون؛ سوونە؛ سن؛ سـنک؛ کیـسەڵە؛ قمل؛ ڕەقەک؛ ڕەقک؛ بەڵا گەنمـە؛ مێروویـەکی مێملی گیایە بە ڕەنگی سەوز، قاوەیی یان ئاوی کە بۆنێکی ناخۆشی لێوە دێ.

**سن** / sen(n) ، ـهـا؛ سنین/: [عربـی]/اسم. تەمـەن؛ تامان؛ عەمر؛ عومر؛ عمـر؛ ئـەمر؛ سـاڵ؛ مـاوەی ژیـان؛ ژمـارەی سـاڵانی ژیـانی زینـەوەرێک بەتایبەت مرۆ.

▣ **سن عقلی**: تەمەنی ژیری؛ ڕێـژەی لێهـاتوویی هزری هەر کەسێک لە چاو تەمەنی.

**سـن قـانونی**: تەمـەنی قـانوونی؛ تەمـەنی ڕووتێکـردنی ئـەرک و مـافی تایبـەتی هـەر کەسێکی پێگەیشتوو لە کۆمەڵدا.

▣ **سنی از کسی گذشـتن**: تەمـەن لـە کەسـێک ڕۆیین؛ چاوکرانەوە؛ لە منداڵی پەڕینەوە ‹دیگر سنی از تو گذشته و باید ایـن چیزهـا را بـدانی: ئیتـر تەمەنیکت لی‌رۆییوە و دەبێ ئەم شتانە بزانی›.

**سنی نداشتن**: تەمەنیکی وا نەبوون؛ کەم‌تەمەن بوون؛ جارێ منداڵ بـوون؛ هێـشتا گـەنج و لاو بوون ‹سارا که هنوز سنی ندارد: سـارا خـۆ هێـشتا تەمەنیکی وای نیە›.

**از سن کسی گذشتن**: لە کەسێک بـووردن؛ بـۆ تەمەنی کەسێک نەبوون؛ لـە کەسـێ بـوردن؛ چیدی شیاوی تەمەنی کەسێ نەبوون ‹دیگر از سن من گذشته که دنبال یادگرفتن تار بروم: چیـدی لە من بوردووە بکەومە شوێن فێربوونی تار›.

**سنا** / sanā، ـها/:/اسم. [عربـی] سـەنا؛ سـینامەکی؛ سەنامەکی؛ دەستەیەک لـە گیاگـەلی دارچکـی یان بۆتەیی گەرمەسێری خۆڕسـک لـە تـاقمی گوڵەئەرخەوان کە گۆپکە و میوەکـەی کەلـکی دەرمانیان هەیە.

**سـنا** / senā/:/اسـم. [فرانـسوی] سـنا؛ پارلـەمانی پیران؛ یەکێ لە دوو پارلەمانی قانوون‌دانانی بڕێ وڵاتان.

**سناً** / sennan/: [عربـی] قید. *[گفتاری]* بە تەمەن؛ بە مانگ و ساڵ ‹سناً از من کوچکتر است: بە تەمەن لـە من منداڵترە›.

**سنات** / sonāt/: [فرانسوی از ایتالیایی]/اسم. سونات؛ بەستەیەکی مووسیقا کە تایبـەتی سـازە (بـەبێ ئاواز) و بە پێی جۆری ساز و ژمـارەی ژەنیـارانی ناوی دەگۆڕێ.

**سناتور** / senātor ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. نوێنـەری سنا؛ ئەندامی پارلەمانی پیران.

**سناریـست** / senārîst ، ـهـا/: [فرانـسوی]/اسـم. فیلمنامەنووس؛ سناریۆنووس: **سناریونویس**

**سـناریو** / senār(i)yo ، ـهـا/: [فرانـسوی]/اسـم. فیلمنامە؛ داستانی فیلم لە سەر کاغەز.

**سـناریونویس** / senār(i)yonevîs/: [فرانـسوی/ فارسی] ☜ **سناریست**

**سنان** / senān/: [عربی]/اسم. *[قـدیمی]* نـەیزە؛ ڕم؛ ڕمب.

**سـنباده** / sombāde, sonbāde ، ـهـا/:/اسـم. زمپەرە؛ زمپارە؛ سماتە؛ سمباتە؛ سمارتە: **سمپار**

▣ **سنگ سنباده** ☜ **سنگ**

**کاغذ سنباده** ☜ **کاغذ**

**سنبل** / sanbal/ ☜ **سَمبَل**

**سـنبل** / sombol, sonbol ، ـها/:/اسم. سـنبل؛ سمـڵ؛ سمـبڵ؛ سـوێنکە؛ هـەلال؛ سیاوسەدە؛ سیاوسـەرە؛ بنێکـی گـوڵ بنەوشـی خۆش ڕەنگ و بۆنە، بۆ جوانی باری دێنن.

**سـنبل‌الطیـب** / sombolottîb, sombolettîb, /sonbolottîb/: [عربـی]/اسـم. ١. گیایـێ ئـالیکی خۆڕسکە بـە لاسکی ئەسـتوور و بـەرزایی زۆر، گەڵای ددانەداری بەرامبەر یەک و گوڵی سـپی یان ئاڵـی بۆنخـۆش بـە ڕواڵـەتێکی چەتراسـاوە ٢. گیاکتـک؛ گیاکتکـە؛ سـملـەتیف؛ ئـاورێژە؛

ئەشەدبۆ؛ ڕێخەداروو؛ سونبلەتیف؛ گیایێکە بۆ دەرمان دەبێ، پشیلە زۆر حەز لە بۆنەکەی دەکا و پێی مەست دەبێ: **آلە؛ والریان؛ والرین**

**سنبلک** / sombolak, sonbolak ، ـھا/: [عربی/ فارسی] *اسم. [گیاەشناسی]* هۆشەڵوو؛ هێشەڵووک.

**سنبلە** / sombole, sonbole/: [عربی]/اسم. ١. ☜ **خوشە ـ ۴** ٢. *[تقویم]* شەشەمین بورج لە ساڵ، ڕێکەوتی مانگی خەرمانان ٣. گل‌آذین سنبلە، **گل‌آذین**

**سنبوسە** / sambûse, sanbûse/: اسم. ١. سێ‌سووچ؛ سێ‌گۆش، بەتایبەت پارچەیەکی سێ‌گۆشە کە لە جل و بەرگی بڕێ ناوچەدا دەیدەوورن ٢. /ـھا/ سەمبووسە؛ چەشنە خواردنێکە، سەبزی، گۆشت یان پوورەی پەتاتە و هەزوێلە و پیاز لە لەتێکی سێ گۆشەی هەویر یان ناندا دەپێچنەوە و لە ڕۆندا سووری دەکەنەوە.

**سنبە** / sombe, sonbe ، ـھا/: اسم. سمە؛ سەمبە؛ سمۆ؛ سۆمە؛ زمە؛ مەتکەو؛ ئامرازێکی باریک و درێژە بۆ تێرۆکردنی شتێ دە نێو پەڕە یان کونێکدا: **سُمبە**

⊡ **سنبە را پرزور دیدن:** *[مجازی]* ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ هێزێکی زۆردا.

**سنبەی کسی پرزور بودن:** *[مجازی]* بە قەوەت بوون؛ پڕ زۆر بوون؛ باهۆدار بوون.

**سنبەنشان** / sombenešān, sonbe-/: اسم. سمەیەکی نووک‌تیژ کە بۆ نیشان دانان لە سەر کانزا بە کار دەڕوا.

**سنبیدن** / sombîdan, sonbîdan/: مصدر. متعدی. *[قدیمی]* نووژین؛ نۆژین؛ سۆنتن؛ نوهتن: ١. کون‌کردن؛ سمین؛ سمتین؛ سمتن؛ سمتاندن؛ سماندن؛ سمەی؛ سمای؛ قوقڵین؛ قۆقلاندن؛ هێرین ٢. ئاژنین؛ فەتاندن؛ هلکەواشتن؛ هلکەوشاندن؛ کۆڵین؛ کنەکردن؛ شەن‌وکەوکردن.

**سنت** / sent ، ـھا/: [انگلیسی]/اسم. سێنت؛ یەک لە سەدی دولار؛ لە پاژگەلی دولار، پارەی ئامریکا، کانادا و چەند وڵاتی‌تر.

**سنت** / sonnat ، ـھا؛ سُنَن/: [عربی]/اسم. ١. ڕست؛ ڕسک؛ ڕستک؛ ڕەسم؛ ڕێچکە؛ داب؛ نەریت؛ هۆرتە؛ دام و دەستوور؛ پێ‌ودان؛ هۆرتەوبەرە؛ بڕوا، خدە، سەلیقە و بیروڕاگەلێ کە لە بەرەیێکەوە بۆ بەرەیەکی‌تر لەگەڕە ٢. *[اسلام]* سوننەت؛ ئاکار و کرداری پێغەمبەری ئیسلام.

⊡ **سنت کردن:** *[مجازی، گفتاری]* خەتەنەکردن؛ سونەت‌کردن.

**سنت گذاشتن:** کردنە ڕەسم؛ نەریت داهێنان؛ داهێنان.

**سنتز** / santez ، ـھا/: [فرانسوی]/اسم. سەنتز: ١. *[شیمی]* تێک‌ئالانی توخم یان تەنگەلی ساکار پێکەوە ٢. تەنێ کە بەم شێوە پێک‌دێ ٣. *[منطق]* هەڤهێم؛ دیالێکتیک؛ ئاکامی کاردانەوە.

**سنت‌شکنی** / sonnatšekanî ، ـھا/: [عربی/ فارسی] اسم. نەریت‌شکێنی؛ داب‌شکێنی؛ ڕست‌شکێنی؛ کار یان ڕەوتی سەر بادان یان بەرەنگار بوونەوە لەگەڵ نەریتدا ‹دانشگاه رفتن دختران و زنان سنت‌شکنی بود: چوونە زانستگای ژنان و کچان، نەریت‌شکێنی بوو›.

**سنت‌گرایی** / sonnatgerāyî ، ـھا/: [عربی/ فارسی]/اسم. ١. نەریت‌خوازی؛ دابوازی؛ ئامۆژە یان کردەوەی کەسانێ کە لایەنگری لە داب و نەریتی کۆن دەکەن ٢. کۆنەخوازی؛ کۆنەپەرستی؛ دژایەتی لەگەڵ نۆباوی و لیبرالیسمدا. هەروەها: **سنّت‌گرا**

**سنتور** / santûr ، ـھا/: اسم. سەنتوور؛ سەمتوورە؛ سازی ژێداری دەندووکەیی بە ٧٢ ژێوە کە هەر چوار سیم بۆ دەنگێک کۆک دەبن و بە دوو میزرابی چێوە باریکەوە دەیژەنن.

**سنتونین** / santonîn/: [؟] ☜ **سانتُونین**

**سنتی** / sonnatî/: [عربی] صفت. دابی؛ نەریتی؛ داب و نەریتی؛ سەر بە داب و نەریتی کۆن.

**ـ سنج** / sanc/: پیوازه. ١. ـ پێو؛ ئامێری پێوان ‹دماسنج: دەماپێو› ٢. ـ هەڵسەنگێن؛ ـ سەنگێن؛ سەنگاندن؛ سەنگین؛ بە توانستی هەڵسەنگاندنەوە ‹سخن‌سنج: وتەهەڵسەنگێن›.

**سنج** / senc ، ـها/:[از عربی]/اسم. چەقەوانە؛ چەقەنە؛ زنج؛ سازی زەربی بە شێوەی دووپەڕەی گروڤەری برنجەیی کە بە یەکیدا دەدەن و دەنگی لێدەردێنن: **صَنج**

**سنجاب** / sancāb ، ـها/:/اسم. سنجاو؛ سەنجاب؛ گیانەوەرێکی گوانداری گچکەی جاکێنەرە بە تووکی نەرم و چڕ و کلکی ئەستوور و کۆڵکنەوە،کە دارەوان و ڕۆژگەڕە.

**سنجاق** / sancāq ، ـها/: [ترکی]/اسم. سنجاخ؛ سنجاقی؛ سنجاق؛ دەرزی؛ کەرەسەیێ گچکەی پێکهاتوو لە ماکێکی ڕەق (وەک کانزا، پلاستیک و...) بۆ پێکەوە لکاندنی چەن شت یان هەڵواسینیان پێکەوە.

▣ **سنجاق زدن**: سنجاخ لێدان؛ دەرزی لێدان.

**سنجاق کردن**: سنجاخ‌کردن؛ لکاندن ‹هر دو را به هم سنجاق کن: هەر دووکیان پێکەوە سنجاخ کە›.

**سنجاق‌ته‌گرد** / sancāqtahgerd ، ـها/: [ترکی/ فارسی]/اسم. سنجاخی سەرخڕ؛ دەمنووس؛ سنجاخێ بە شێوەی میخێکی ناسک، بچووک و نووک‌تێژ: **سوزن ته‌گرد**

**سنجاق‌سر** / sancāqsar ، ـها/: [ترکی/ فارسی]/اسم. قژگیرە؛ گیرەی سەر؛ جۆرێ گیرەی دوودەمە، دینەوە یەک و قژ لە نێوان خۆ ڕادەگرن.

**سنجاق‌سینه** / sancāqsîne ، ـها/: [ترکی/ فارسی] /اسم. گوڵ بەرسینە؛ زەمبەرێ کە بە سنجاخ گیرەوە لە بەرۆکی دەدەن.

**سنجاق‌قفلی** / sancāq.qoflî ، ـها/: [ترکی/ عربی] /اسم. دەرزی‌ڕووسی؛ دەرزی ئینلیسی؛ چەنە نیسیە؛ جناق؛ لاک؛ چەنۆ دەسماڵا؛ تەلێکی لوول‌دراوە، سەرێکی دەرزی و سەرێکی قولاوە و لێک دەئاڵێن، بۆ بەستن یان دالکاندنی شتێک بەسەر شتێکی‌تردا.

**سنجاقک** / sancāqak ، ـها/: [ترکی/ فارسی]/اسم. پووش‌بەقنگە؛ پووش‌بەقوونە؛ زەل‌بەقوونە؛ زەلەقوونگ؛ زلاقوونک؛ چوکڵەقنگە؛ چوکڵەعنە؛ دومدیکە؛ زل‌بەقنگە؛ زل‌بەقوونە؛ مێروویەکی فرۆکە بە لەشی پستەیی کەمڕەنگ، چاوی زل و زەق، دووباڵی ناسکی جوان و ڕەنگامە و سکی باریک و درێژەوە و پێگەیشتووی ڕاوچی و تون‌فڕە و لەسە ئاو یان بەسەر گیای ئاوژیەوە گەرا دەکا.

**سنجاق‌کش** / sancāqkeš ، ـها/: [ترکی/ فارسی] /اسم. سنجاخ‌کێش؛ سنجاخ‌کەن؛ کەرەسەیەکی وەک گیرە بە دوو دەمی نووک‌تیژەوە بۆ لێکردنەوەی سنجاخ لە کاغەز: **سوزن‌کش**

**سنجد** / senced ، ـها/:/اسم. سرینچک؛ سرنیچک؛ سرنجگ؛ سرنجی؛ سینچک؛ سنج؛ سنجە؛ سەنجیە؛ سنجۆ؛ سنجوو؛ سنجۆک؛ سنجی؛ سنجەی؛ سنجەوی؛ سینجی؛ سنجید؛ ئاردگن؛ گوسنج؛ لاسی دەسچێن: ١. داری سنجوو و هاوماڵەکانی؛ دارێکی دڕکاویە بە گەڵای هێلکۆکەیی و ڕووبەری زیوین لە ژێرەوە، زۆر گوڵی بچووکی بۆنخۆشی ناو زەرد و دەر زیوین دەکا ٢. بەری پێگەیشتووی ئەو دارە کە ئەوەندەی زەیتوونێکە، بە تێکوڵی زەرد، نارنجی یان سوور، گۆشتی سپی وەک ئارد (کە ماکی قەندی تێدایە) و ناوکێکی درێژۆکەی لووسی چێویەوە.

▣ **سنجد تلخ** ☜ **سنجدتلخ**

**سنجدتلخ** / sencedetalx/:/اسم. سرینچکەتاڵە؛ سنجوەتاڵە؛ دارێکی لێڕەواری جوانە بە گەڵای پێکهاتوو لە وردەگەڵای نووک‌تیژ و ددانەدار، گوڵی بنەوشی هێشوویی و بۆنخۆش و بەری

زەرد و ژەهراوی وەک نۆک و پێشەی ڕەقەوە: **زیتون تلخ؛ شال پستانه؛ شال زیتون؛ شال سنجد؛ شیطان زیتون**

**سنجدی** / sencedî/: *صفت.* سورینچکی؛ سنجەیی؛ سنجوویی؛ بە ڕەنگی سورینچک (سووری ئاماڵ نارنجی).

**سنجش** / sanceš ، ـها/:*اسم.* ١. کار و ڕەوتی هەڵسەنگاندن؛ دوپیەک ‹سنجش معلومات: هەڵسەنگاندنی زانیاری قوتابیان› ٢. ئەندازەگری؛ کاری پێوان؛ وەهەنگاوتن ‹سنجش گرمای هوا: پێوانی تینی هەوا›.

**سنجشگر** / sancešgar ، ـها/:*اسم.* ١. ـها/ هەڵسەنگێن؛ هەڵسەنگێنەر؛ نرخێنەر؛ نەهێنەر؛ کەسێ کە (برشت یان لێهاتووی) کەس یان شتێک هەڵدەسەنگێنێ ٢. پێپێو؛ پێوەر؛ ئامێر یان کەرەسەیەک کە شتێ (وەک خێرایی یان کات) دەپێوێ.

**سنجه** / sance ، ـها/:*اسم.* پێوانە: ١. سەنگاتی؛ شتێ کە چەندایەتیەکی پێ دەپێون (وەک تەرازوو) ٢. سەنگ؛ چەندیەتیەک کە بۆ ئەندازەگرتن بە کار دەڕوا (وەک سەنگی تەرازوو).

**سنجه شناسی** / sancešenāsî/:*اسم.* پێوانەناسی؛ زانستی پێوان و هەموو ئامراز و کەرستەی ئەندازەگرتن: **اندازەشناسی**

**ـ سنجی** / sancî/: *پیواژە.* ـ هەڵسەنگێنی؛ ـ سەنگێنی؛ کاری هەڵسەنگاندن/ سەنگاندن ‹بینایی سنجی؛ شنوایی سنجی: بینایی هەڵسەنگاندن؛ بیسایی سەنگاندن›.

**سنجیدگی** / sancîdegî/:*اسم.* گونجاوی؛ لەباری؛ دروستی شتێک و تەبا بوونی لەگەڵ پێوەرە ناسراوەکاندا.

**سنجیدن** / sancîdan/: *مصدر. متعدی.* // **سنجیدی:** هەڵتسەنگاند؛ **مىسنجی:** هەڵدەسەنگێنی؛ **بسنج:** هەڵسەنگێنە// هەڵسەنگاندن؛ هەڵسەنگانن؛ بەراوردکردن: ١. وەهەنگاوتن؛ پێوان؛ پیمەی؛ پیڤان؛ ئەندازەگرتن؛ سەنگاندن؛ چەندیەتی شتێک بە ئامێرێک پێوان ٢. نەهاندن؛ نرخاندن؛ خەملاندن؛ قەرساندن؛ قرساندن؛ سەنگاندن؛ قەبلاندن قەولاندن؛ هەسباندن؛ کرێشەیش؛ هێژاندن ‹موقعیت را سنجیدن: هەل هەڵسەنگاندن› ٣. لە بەر یەک نان؛ لە یەک دان ‹دو چیز را با هم سنجیدن: دوو شت پێکەوە هەڵسەنگاندن› ٤. *[قدیمی]* کێشان؛ کێش کردن؛ کێشەی؛ سەنگوسووک کردن. هەروەها: **سنجیدنی**

■ صفت فاعلی: **سنجنده** (هەڵسەنگێنەر)/ صفت مفعولی: **سنجیده** (هەڵسەنگێنراو)/ مصدر منفی: **نَسنجیدن** (هەڵنەسەنگاندن)

**سنجیده** / sancîde/: *صفت.* گونجاو؛ لەبار؛ شیاو؛ هێژا ‹رفتار سنجیده: ئاکاری گونجاو›.

**سنخ** / senx ، ـها/: [عربی]*اسم. [ادبی]* جۆر؛ چەشن؛ جنس؛ نفش.

**سنخیت** / senxîyyat/: [عربی]*اسم.* هاوچەشنی؛ هاونفشی؛ هاوڕەگەزی؛ جۆری؛ هامجنسی؛ بار یان چۆنیەتی لە یەک جۆر بوون ‹هیچ سنخیتی میان ما نبود: هیچ هاوچەشنیەک لە نێوانماندا نەبوو›.

**سند** / sanad ، ـها؛ اسناد/: [عربی]*اسم.* بەڵگە؛ بەنگ؛ سەنەد؛ نیشانە: ١. نڤیسک؛ نووسراوەیێ کە بۆ سەلماندن یان دانە دواوەی خوازەیەک کەڵکی لێ بگیردرێ ٢. نڤیسک؛ قەباڵە؛ قەواڵە؛ نووسراوەیەکی دەستنووسی یان فەرمی کە هۆ یان چەسپێنەری شتێکە ٣. دەلیل؛ پاژ؛ هەر چەشنە نووسراوە یان شتێ کە نیشانەی ڕاستی شتێکە.

▣ **سند انتقالی:** *[بانکداری]* بەڵگەی ڕاگوێزی؛ بەڵگەیێ کە ڕاگوێزانی هەندێ پارە لە حیسابێکەوە بۆ حیسابێکیتر نیشان دەدا.

**سند رسمی:** بەڵگەی ڕەسمی؛ نیشانەی فەرمی؛ بەڵگەیێ کە لە مەزرینگەیەکی

دەوڵەتی یان لە نووسینگەیەکی بەڵگەی ڕەسمیدا، بە گوێرەی قانوون ڕێکدەخرێ.
**سند مالکیت:** تاپۆ؛ قۆچان؛ کەواڵ؛ قەباڵە؛ قەبارە؛ بنچاخ؛ چاخ؛ قەباڵەی ملک؛ قەباڵەی موڵکایەتی؛ بەڵگەیێ کە خاوەن بوونی کەسێک بە سەرماڵێکدا پیشان دەدا.
◘ **سند زدن:** قەباڵە نووسین؛ سەنەد لێدان.
**سند کردن:** کردنە سەنەد؛ سەنەد/ قەباڵە دەرهێنان.
**سند** [1] / send/: *اسم. [قدیمی]* زۆڵ؛ زوێڵ؛ زۆڵەک؛ بیج؛ بیچ؛ پیچ؛ بیژوو؛ بیژی؛ قومەزە؛ سووتار؛ سووتاڵ؛ سنۆتە؛ سنۆرتە؛ بەچکەی ژن و شووی لێک مارەنەکراو.
**سند** [2]: *صفت.* زۆڵ؛ زۆڵەک؛ بیج؛ بیچ؛ پیچ؛ بیژوو؛ بیژی؛ سووتار؛ سووتاڵ؛ سنۆتە؛ قومەزە؛ بەدیهاتوو لە جووت بوونی ناڕەوا.
**سند** / sond/: [فرانسوی] ☜ **میل ـ۲**
**سنداژ** / sondāj/: [فرانسوی] *اسم.* ۱. کاری گومانە لێدان ۲. *[پزشکی]* سۆنداژن؛ کاری سۆند پێداکردن * **سونداژ**
**سندان** / sendān ، ـها/: [سریانی] *اسم.* ژێردەم؛ سندان؛ سنگان؛ سننان؛ سندیان؛ سنچیە؛ دەزگا؛ دەستگا؛ لەتە پۆلایەکی قورس و پتەو و تەخت کە کانزای بە سەرەوە دەکوتن.
◙ **سندان گوش:** ئێسکی سندانی؛ ئێسکیلەی ناوینی گوێ.
**سندانی** / sandānî/: [سریانی] *صفت.* سندانی؛ زنانی ‹استخوان سندانی: ئێسکی سندانی›.
**سندر** / sandar ، ـها/: [؟] *اسم.* دارتووس؛ دارتەویس؛ درەختێ بە کوتەی سپی، گەڵای بادامی نووک تیژی ددانەدار و هێشووەگوڵی نێرینەی شۆڕ و پووڵەکەییەوە کە دارەکەی بۆ کاغەز و ماکی دەباخی، گەڵاکەی بۆ چایی و ئاوەکەشی لە شەرابدا کەڵکی هەیە.
**سندرم** / sendrom ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* دیاردە؛ دەستەیێک نیشانە کە پێکەوە سەر هەڵدەدەن و هەواڵ لە نەخۆشی یان بەرژەنگێ دەدەن.
**سندروس** / sandarûs, sandrûs ، ـها/: [معرب از یونانی] *اسم.* سەندەلووس؛ دارچکێکی بچووک لە دەستەی سەولی کێوی کە جەویەکەی بۆ دەرمان دەبێ.
**سندسازی** / sanadsāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کار یان ڕەوتی بەڵگە هەڵبەستن.
**سنده** / sende, sonde/: *اسم. [مستهجن]* سل؛ سنلە؛ تنگ؛ سلەگوو؛ تەپەگوو؛ سڵتەگوو؛ ساقەگوو.
**سندەسلام** / sendesalām, sonde-/: [فارسی/ عربی] *اسم.* باپشکێو؛ سیتکەسڵاو؛ سیتکەسڵاوە؛ سیتکەزەلام؛ سیچکەسڵاو؛ سیچکەسڵاوە؛ سیسکەسەلا؛ قنیچکەسڵام؛ قنچکەسڵاو؛ چینچک؛ چینچکەسڵاوە؛ چیچکەسڵاو؛ چنچکەسلێمانە؛ سینچکە؛ فردۆک؛ دیقلۆک؛ سلەزەوە؛ مووریسلام؛ بوکک؛ دگدگە؛ زیپکەی چلکی لە چنی پێڵووی چاودا.
**سندیت** / sanadîyyat/: [عربی] *اسم.* بەڵگایەتی؛ بەڵگەیەتی؛ بار و دۆخی بەڵگە بوون.
**سندیکا** / sandîkā, sendîkā ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* سەندیکا؛ یەکیەتی؛ یەکێتی؛ ڕێکخراوەیێ کە لە یەکانگیر بوونی کەسان، تاقم یان وڵاتانی هاومەبەست و هاودۆز پێکدێ.
**سندیکائی** / sandîkā'î, sendîkā'î/: [فرانسوی] ☜ **سندیکایی**
**سندیکالیسم** / sandîkālîsm, sendîkālîsm/: [فرانسوی] *اسم.* سەندیکالیسم؛ ئامۆژەیەک لە بزووتنەوەکانی کرێکاریدا کە زاڵ بوون بە سەر سەرمایەداری و گرتنە دەستی دەسەڵات، لە ڕێگەی مانگرتن و خەبات لە چوارچێوەی یەکیەتی کرێکاران دەزانێ و خەباتی سیاسی و ئیدیۆلۆژیانە ڕەت دەکاتەوە. هەروەها: **سندیکالیست**

**ســـــندیکایی** / sandîkāyî/: [فرانـــسوی] صـــفت. سەندیکایی؛ سەر بە سەندیکا: **سندیکائی**

**سنسور** / sensor ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. کەرەسەیێ کە لە هەمبەر دیاردەیەکی فیزیکی دیاریکراوەوە (وەک تیشک، گەرما، سەرما و...) دەکەوێتە کار و مرۆ وریا دەکاتەوە یان کاردانەوەیەک دەنوێنێ.

**سنفنی** / sanfonî/: [فرانسوی] ☜ **سَمفُنی**

**سنفنیک** / sanfonîk/: [فرانسوی] ☜ **سَمفُنیک**

**سنفونی** / sanfonî/: [فرانسوی] ☜ **سَمفُنی**

**سنفونیک** / sanfonîk/: [فرانسوی] ☜ **سَمفُنیک**

**سنقر** / sonqor ، ـها؛ ـان/: [ترکی]/اسم. شمقارِ؛ شنقار؛ ڕیگزادە؛ لـە زلـترین بازگـەلی ناوچـەی ساردەسێرە، بە جەستەیەکی باریک، باڵی درێـژ و کەل و پێ و جووچکی درێژەوە کە لە بەرزایی کەمـدا دەفـڕێ و لـە زەوی یـان قامیـشەڵاندا هێلانە دەکا: **سارگِپە**

▣ **سـنقر تـالابی**: شمقـارِی زەلکـاوی؛ جۆرێـک شمقارِی زلی باڵپانی نزمفڕە، کـە زۆرتـر لـە زەلکاوان دەنیشێتەوە.

**سنقر عسل‌خوار**: حەسەنە سستە؛ پەلـەوەرێکی وەک هەلۆیە بە سەری بچووک و ملی درێژ و پەڕ و باڵـی ڕەنگامـەوە کـە مـەلی بچـووک، مـشک و مـێش دەخـوا و پتـر لـە قـەراخی دارسـتان و لـەسـەر کۆنـە هێلانـەی قـەلان هەلدەنیشێ.

**ســـنکپ** / sankop/: [فرانـــسوی]/اســـم. /پزشـــکی/ ١. خـــوو؛ گەشـــکە؛ غـــەش؛ نـــەهش؛ فەرکـــەم ٢. وێـــــست؛ شەپــــلە؛ قۆتـــــک. هـــــەروەها: **سنکپ‌کردن**

**سنگ** / sang ، ـها/:اسم. ١. بەرد؛ بـەر؛ کوچـک؛ کوچگ؛ سەنگ؛ تەوەنی؛ تونی؛ کەڤر؛ کـەمور؛ کەرا؛ کارا؛ تەنی تۆکمە و پتەوی سروشـتی کـە لە خاک یـان کانەگـەلی جۆراوجـۆر پێکهـاتووە ٢. گۆهەر؛ گەوهەر؛ جەواهیر ٣. کێش؛ سـەنگ ‹سـنگ تـرازو: کێـشی تـرازوو› ٤. /مجـازی/ پـەل؛ دارەست؛ دژواری؛ بەر ٥. /پزشکی/ بەرد؛ سەنگ؛ تەنێ ڕەق کە لە بـڕێ ئەنـدامی لەشـدا درووس دەبێ ‹سنگ کلیه: بەردی گورچیلە›.

▣ **سـنگ آتـشزنه**: بـەردە ئەسـتێ؛ بەردەسـتێ؛ بەردئەسـتێ؛ بەرەسـتی؛ بەرسـتە؛ بـەرداگرە؛ بـەردی چـەخماخێ؛ بەردەچـەرخ؛ بـەردە چـــــەخماخ؛ تـــــەوەن چـــــەخماخ؛ کوچـکچەخماخـە؛ کەڤـر ئـەزێر؛ بـەردی ئاگرپژێن؛ سەنگی چەخماخ؛ بـەردێکی ڕەق و تورت و تۆکمە لە جنسی سیلیـسی گوشـراو، بە ڕەنگی ڕەش، قاوەیی یان خۆڵەمێشی کـە بۆ چەخماخە لێدان و ئاگر کردنەوە بەکاردێ.

**سـنگ آتشفـشانی**: بـەردی گـڕکانی؛ بـەردە گڕکانی؛ بەردێکی ئاگرینی بلۆرئاسایە کـە لـە سەر زەوی یان لە ئاستێکی نێزیـک لـە سـەر زەوی، بەهۆی چالاکی گڕکانەوە پێکدێت.

**سنگ آذرین**: بـەردی ئـاگرین؛ بـەردەئاگرین؛ بـەردێ کـە لـە ماکـە تواوەکـانی گـڕکان پێکدێ.

**سنگ آسمانی**: شخانە؛ بەردێ کە لە مـەودای نێوان گەڕۆکانی ئاسمانەوە بەرەو زەوی دێ.

**سنگ آسیا**: هارە؛ بـەرداش؛ بـەراش؛ فـەراش؛ بەرد ئاسیاو؛ سەنگ ئاساو؛ بەرێئێش؛ سەنگ ئاســیاو؛ هارەئاســاو؛ هاراســیاو؛ کــەتابنی؛ کەتاسەری؛ بـەردە هـاڕ؛ بـەراڤ؛ تلـت؛ خـرە بـەردێکی زلی یـەکڕوو گـرنج، لـە جنـسی بەردی بنگرتـووی سیلیـسی کـە بـۆ کردنـە ئاردی دانەوێڵە بەکەلکدێ.

**سنگ آهک**: بـەردی قـسڵ؛ بـەردی ئاهـەک؛ بـەردێ کـە زۆرتـرین بەشـی کـەربونـاتی کەلسیۆمە.

**سنگ بنا**: ١. بەردی بنـەڕەت؛ بـەردی بناغـە؛ تەمەڵە؛ تەمەڵیت؛ بەردێ کە لە هیمی ماڵـدا دەڕوانە کار ٢. /مجازی/ بنـەڕەت؛ شەنگـستە؛ بنەما؛ بنچینە؛ بارخانوو؛ بارخـانی ٣. سـەنگ؛

سەنگی خانووبەرە.

**سنگ بلور:** دور؛ مرواری کێوی بێ ڕەنگ و ڕوون.

**سنگ پا:** بەردەپێ؛ بەردەپا؛ پاشۆر؛ سەنگ پا؛ پێ شۆر: ١. بەردە ئاگرینی سووک و هەوری و ڕەش بە ڕووبەرێکی گرنج ـ گرنجەوە کە بۆ شۆردنی پێ کەڵکی لێ وەردەگرن ٢. بەردەشیشەی گڕکانی کون ـ کون و کلۆر ـ کلۆر کە زۆر سووکە و ڕەنگەکەی سپی یان خۆڵەمێشیە.

**سنگ ترازو:** بەردە قەپان؛ بەردی ترازوو؛ سەنگ؛ کێشێ کە بۆ هەڵسەنگاندنی ڕێژەی کاڵا دەیخەنە سەر ترازوو.

**سنگ جهنم** ☜ نیترات نقره، **نیترات**

**سنگ چاپ:** بەردی چاپ؛ بەردی ئاهەکی دەنکورد کە لە چاپی بەردیدا بە کار دەچوو.

**سنگ چاقوتیزکنی:** هەسان؛ بەردەسان؛ بەردەساو؛ بەراڤ؛ جۆرە بەردێکی سیلیسی کە بۆ لووس کردنی کانزا و تیژکردنی چەقۆ کەڵکی لێ وەردەگرن: **سنگ فسان**

**سنگ چخماق** ☜ **سنگ آتشزنه**

**سنگ خروجی:** بەردێ کە بە هۆی بزوانی گڕکانەوە هاتۆتە سەر زەوی.

**سنگ دگرگون:** بەردی گۆڕاو؛ بەردێ کە بە هۆی هۆکارگەلی جۆراوجۆری ئاقار (وەک گوشار و دەما) گۆڕاوە و بۆتە بەردێکی تر.

**سنگ ساختمانی:** بەردی ساختومان؛ کوچک ماڵ کردنەوە؛ هەر یەکە لەو بەردانە لە دروستکردنی ماڵ و وارخاندا بە کار دێن.

**سنگ سلیمانی:** ئاقیق؛ بەردی سلێمانی؛ بەردی کوارتز.

**سنگ سماق:** جۆرێک بەردی گڕکانی کە لە پێکهاتەیدا بلووری گەورە کەوتۆتە نێوان بلووری وردەوە.

**سنگ سنباده:** بەردی سماتە؛ زروە؛ بەردە زروە؛ کەورە زبرە.

**سنگ سیاه:** بەردە ڕەشە؛ کوچکەڕەش.

**سنگ صابون:** بەردە سابوون؛ بەردێکی گۆڕاوە کە لە دەست لێداندا وەک سابوونە و زۆرتر لە دەڵق و ماکیتر (وەک میکا، کوارتز، ئاسن و...) پێکهاتووە و لە ڕەنگی خۆڵەمێشیەوە تا سەوزی هەیە و بە چەقۆ دەبڕدرێ

**سنگ صبور:** *[فرهنگ مردم]* ١. بەردێکی ئەفسانەیی کە خەڵکی دەردەدڵیان بەلاوە دەکرد ٢. *[کنایی]* مامەخەمە؛ خەمان؛ خاڵەخەمە؛ خەمخۆرەی هەورامان؛ کەسێکی دەردناس و پڕزوو کە بکرێ دەردەدڵی وەلاوە هەڵڕێژی.

**سنگ صفرا:** سەنگ سەفرا؛ بەردەزێلک؛ کوچکەزراڤ؛ بەردی زراو؛ بەردێ کە لە کیسە زەرداودا پێک دێ. هەروەها: **سنگ کلیه؛ سنگ مثانه**

**سنگ فَسان** ☜ **سنگ چاقوتیزکنی**

**سنگ قبر:** کێل؛ کێلە؛ هەنگێزە؛ دووبەرد؛ میل؛ هەدد؛ بەردی قەبر؛ بەردێ کە بۆ ناسینەوەی مردوو لە سەر گلکۆی دادەنێن و زۆر جار ناوەکەشی بە ڕوویەوە دەنووسن: **سنگ لحد**

**سنگ لحد** ☜ **سنگ قبر**

**سنگ لوح:** تۆڵاشە بەرد؛ پلاشە بەرد؛ درک؛ گلەبەردی گۆڕاوی دەنکورد کە بە سانایی تۆڵاش ـ تۆڵاش دەبێتەوە.

**سنگ مجسمه:** بەردی پەیکەرە؛ سیلیکاتی ئاوداری ئەلەمینیۆم بە ڕەنگی سەوزی کاڵ کە پەیکەر و شتی جوانی لێ دروست دەکەن.

**سنگ محک:** بەردەزموون؛ بەردی مەحەک؛ بەردی زێڕئەزموون؛ بەردێکی ڕەشی زۆر ڕەقە بۆ هەڵسەنگاندنی عەیاری زێڕ.

**سنگ معدن:** کانە؛ بەردی کان؛ بەردی وا کە

بایەخی لە کێو دەرهێنانی هەبێ.

**سنگ معده:** بەرد/ سەنگی گەدە؛ خلتێ کە برێ جار لە گەدەدا دەنیشێ، یان بەردێ کە گیانەوەر قووتی دەدا.

**سنگ نمک:** خوالێن؛ بەردە خوێ؛ کانەی کلوریدی سدیۆم کە بێ خەوشەکەی ڕوون و بێ‌ڕەنگە.

▣ **سنگ انداختن به چیزی:** پەڵ خستن بۆ شتێ؛ پەڵ بۆ شتێ فڕە دان؛ کوچک بۆ شتێ پەرت‌کردن؛ تەوەن شەی پەی چێوێوی ‹سنگ انداخت شیشەی همسایه را شکست: پەڵی خست شیشەی جیرانەکەمانی شکاند›.

**سنگ انداختن جلو پای کسی:** *[کنایی]* تەگەرە خستنە بەر پێ کەسێک؛ بۆ کەسێک کۆسپ نانەوە؛ چوکڵەشکێنی کردن لە کاری کەسێکدا ‹به قدری سنگ جلو پایش انداختند که دست از کار کشید: هێندەیان تەگەرە خستە بەر پێی، دەستی لە کارەکە هەڵگرت›.

**سنگ بزرگ برداشتن:** *[کنایی]* تیکەی زل گرتن؛ دەست دانە کارێکی دژوار و دەستنەداوەوە.

**سنگ به ترازوی کسی نگذاشتن:** *[کنایی]* کا/ گوو بە کڵاوی کەسێ نەپێوان؛ ئاوڕ لە کەسێک نەدانەوە.

**سنگ به شکم خود بستن:** *[مجازی]* کەم خواردن و کز دانیشتن؛ برسیەتی کێشان و هەڵکردن لەگەڵ کوێرەوەریدا.

**سنگ تمام گذاشتن:** *[مجازی]* سکە/ گاڵە پێ‌کردن؛ کارێک بە باشی و بێ‌کەم و کووڕی جێبەجێ کردن.

**سنگ خود را با کسی واکندن:** *[مجازی]* لەگەڵ کەسێکدا یەک‌لاکردنەوە/ قاڵ برینەوە/ یەکچاوکردنەوەی باس و خواسێک.

**سنگ را بستن و سگ را گشودن:** *[کنایی]* کار دێوکردن؛ کا بە پشیلە و گۆشت بە کەر دان؛ کاری پێچەوانە و ناڕەواکردن.

**سنگ روی چیزی گذاشتن:** *[کنایی]* سەری شتێ نانەوە؛ دەست لە شتێ بەردان؛ لە سەر شتێ نەڕۆیشتن.

**سنگ روی سنگ بند نشدن/ نماندن:** *[کنایی]* ئاداری بە سەر پادارەوە نەمان؛ بەرد بە هەردەوە نەوێستان؛ ئاخۆران-باخۆران بوون؛ زۆر ئاڵۆز بوونی بار و دۆخ.

**سنگ روی یخ شدن:** *[کنایی]* دەم بوونە تەڵەی تەقیو؛ بوونە پووشێکی وشک؛ ناکام و سەرشۆڕ بوون. هەروەها: **سنگ روی یخ کردن**

**سنگ زدن:** بەرد لێدان: ١. بە بەرد لە شتێک دان؛ دانە بەر پەڵ ٢. بەرد خستن/ هاویشتن؛ پەڵ هاویشتن؛ کوچک فڕەدان؛ تەوەن شای.

**سنگ سر راه کسی شدن:** *[مجازی]* بوون بە چقڵی مەم و زینان (بۆ کەسێ)؛ بوون بە بەردی بەرهێلی کەسێک؛ بیەی بە تلوو وەروو هیتێ؛ بوونە کۆسپ و لەمپەر بۆ بەرێوەچوونی کاری کەسێک.

**سنگ کردن:** *[مجازی]* بەر بە فرۆشی شتێ‌گرتن.

**سنگ کسی/ چیزی را به سینه زدن:** *[مجازی]* تاسووی کەسێ/ شتێ کێشان؛ خۆ بۆ کەسێ یان شتێک کوتان؛ زگی خۆ بۆ کەسێ یان شتێک دڕان.

تیر کسی به سنگ خوردن ☜ **تیر**

**سنگاب** / sangāb ، ها/: *اسم. [قدیمی]* سەنگاو: ١. حەوزۆکەیەکی بەردی کە لە برێ مزگەوتان یان زیارەتی پیر و چاکان دایاندەنا و ئاوی خواردنەوەیان تێ‌دەکرد ٢. ماقۆڕ؛ چاڵەقۆتێ؛ تەو؛ بەردی قووڵ کە ئاوی تێدا ڕادەوەستێ.

**سنگارد** / sang'ārd, sangārd/: *اسم. [زمین‌شناسی]* بەردارد؛ سەنگارد؛ ماکی بەردینی ورد کە لە سوانی یەخەچاڵان پێک‌هاتوون.

**سنگ‌اندازی** / sang'andāzî ، ها/: *اسم.*

١. بەرتــــڤک؛ بەردەفــــڕکێ؛ پەڵـــــەفرکێ؛ بــەردهاوێژی؛ تەوەنەفــڕانی؛ کــار یــان ڕەوتی ڕانــــدن؛ کوچـــــک خـــــستن ٢. *[مجــازی]* چوکلەشکێنی؛ کارەڕەهـاتی کۆسـپ و تەگـەرە نانـەوە بــۆ نــەکرانی کارێــک ‹در اداره بعـضی‌هـا سنگ‌اندازی می‌کردند و نمی‌گذاشتند کار پیش برود: لـە مەزرینگـــەدا بـــڕێ چوکـــلەشکێنیان دەکـــرد و نەیاندەهێشت کار بچێتە بەرەوە›.

**ســــنگبری** / sangborî/: *اســـم.* بەردبـــڕی؛ سەنگبڕی: ١. کار و ڕەوتی بڕینەوەی تاشەبەرد بۆ کـاری خانووبـەرە ٢. کارگـەی سـەنگبـڕی. هەروەها: **سنگ‌بر**

**ســـنگ‌پرانـــی** / sangparānî/: *اسم.* بەرتـڤک؛ بەردەفڕکێ؛ بەردهاوێژی؛ کار یان ڕەوتی ڕاندن؛ هاویشتن؛ کوچک فڕەدان؛ پەڵ خستن.

**سنگ‌پشت** / sangpošt/: *اسم.* کیسەڵ: ١. ـ‍ها؛ ـ‍ان/ کیسەڵی؛ کووسەل؛ کوویسەڵ؛ کەوسـەل؛ کــسل؛ کیـــسۆ؛ کیـــسوو؛ کووســـی ٢. *[نجـوم]* وێنەیـەکی چکۆلـەی گـەردوونی لـە ئاسمـانی نیمەگۆی باکووریدا: **شلیاق**

**ســنگپوز** / sangpûz ، ـ‍ها/: *اسم.* *[زمـین‌شناسـی]* قـۆقزە؛ دەرپـەڕیوی باریـک و درێـژی وشـکاتی دەنێوی ئاودا.

**ســـنگپوش** / sangpûš/: *اســـم.* *[زمـــین‌شناســـی]* بـەردەڕێژ؛ بـەردەبووم؛ سـەنگڕێژ؛ سـەنگفەرش؛ تۆژێک لە ماکە بەردیەکان لە بەشێکی بەربلاوی توێکڵی زەویدا کە بە خاک داپۆشراوە.

**سنگتراش** / sangtarāš/: *اسم.* ١. بەردبڕ؛ بەربڕ؛ بەردتاش؛ تـەوەنتاش؛ کەڤـرتراش؛ کـەفرتراش؛ نەقار؛ کوچک‌تاش؛ سەنگ‌تـراش؛ ئـەوی کـاری کۆلین، تاشین، سواندن و بیچم پێـدانی بـەردە، بەتایبەت بۆ خانوو ٢. *[نجوم]* وێنەیەکی چکۆلەی گەردوونی لە ئاسمـانی نیوەگـۆی باشـووریدا ❊ **حجار**

**سنگتراشی** / sangtarāšî/: *اسم.* ١. کـاری بـەرد تاشین؛ بەر بڕین؛ ڕەویرتن؛ کارێ کە بـەردتاش دەیکـا ٢. /ـ‍ها/ کارگـەی بەردبـڕی ٣. /ـ‍ها/ بەردتاشـی؛ بەردکۆڵـی؛ بەردبـڕی؛ نەخـشی هەڵکۆڵراو یان قۆقزی ڕووی بەرد ❊ **حجاری**

**سنگچین** / sangčîn/: *اسم.* بەردچن؛ کوچک‌چن؛ سەنگچن: ١. شوێنێ کە بە چنینی ڕزنەبەردێک دیاریان‌کردووە ٢. نژار؛ خن؛ نـژن؛ ئـەو بەردانـە کە بە شێوەی دیوار یان حەسار لـە سـەر یـەک کەلەکەکراون ٣. نژیار؛ ماڵی سەنگ‌چن.

**ســنگ‌چینــی** / sangčînî/: *اسـم.* بـەردچنی؛ کوچک‌چنی؛ سەنگچنی: ١. نـژار؛ نـژن؛ کـاری چنـینی بـەرد لـە جێیـەک ٢. نژانـدن؛ کـاری هەڵچنینی دیوار بە وشکەبەرد.

**ســــنگدان** / sangdān/: *اســـم.* ســـیکەتۆرە؛ کولـــەزرگ؛ ســـیقەتۆرە؛ زیقـــەتۆرە؛ بەشـــی ماسـوولکەیی گـەدەی زۆربـەی پەلـەوەران کـە هەرچی خواردوویانە، تێدا ورد دەبێ.

**سـنگدل** / sangdel ، ـ‍ها؛ ـ‍ان/: *صفت.* *[مجـازی]* دلــڕەق؛ دلــڕەش؛ بــێبــەزە؛ دلــسەخت؛ بــێ ئاوڕدانەوە لە حەنای ئێش و مەینـەتی خەڵـک. هەروەها: **سنگدلی**

**سنگ دوزی** / sangdûzî/: *اسم.* پووڵەکەدووری: ١. نەخشێکی ڕازێنەیی کە بە مووروو، مەنجوق، پووڵەکە و بەردی بریکەدار، لەسەر جل و بەرگی دەدوورن ٢. هونەری ئەو شێوە دوورینە.

**سـنگر** / sangar ، ـ‍ها/: *اسم.* چەپـەر؛ سـەنگەر؛ سـنگر؛ خـەڵ؛ خـەل؛ سـووپەر؛ سـپێر؛ سـپەر؛ مـەترەس؛ مەتـەرێس؛ مەتـەرێز؛ تـاپی؛ تابیـە: ١. پەناگەیەک لە هەمبـەر سـوپای نـەیاردا کـە لەمپـەری بینـران یـان ئەنگێورانـە ٢. *[مجـازی]* شوێنی خەبات؛ شوێنی ملە؛ جێی بەرەنگاری.

◘ **سنگر بستن:** سەنگەر بەستن.

**سنگر گرفتن:** سەنگەرگرتن؛ جێ‌گرتن لـە نێـو یان لە پشتی سەنگەردا.

**سنگربندی** / sangarbandî/: *اسم.* سەنگەربەندی؛

کار و ڕەوتی سەنگەر درووس کردن.

**سنگ‌رست** / sangrost/: *صفت. [گیاه‌شناسی]* بەردەڕسک؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی ڕوان لە بەردەلاندا.

**سنگروی** / sangrûy/: *اسم.* بەردینە؛ تریێ قەلەڕەشکە؛ گیایەکی هاوینی بە لاسکی چێوی، گەڵای دەرزیلەیی لووس، گوڵی سوور، بەری ڕەش و ترش و لە بیچمی ترێ کە بۆ دەرمان بەکاردێ.

**سنگریز** / sangrîz/: *اسم. [زمین‌شناسی]* زاخر؛ زاخێر؛ ڕێخەلان؛ ڕاخێز؛ ڕاخێزیە؛ ڕاخێزیا؛ خێشیا؛ ڕێزەخاڵ؛ ناوڕێز؛ کۆمایەک لە خڕکە و خێز دە لاپاڵ یان بناری چیادا، کە زۆرتر لێژ و ڕژدە.

**سنگریزه** / sangrîze ، ـها/: *اسم.* زگار؛ زغرک؛ زخور؛ خڕەبەرد؛ چەو؛ زیخ؛ زیچ؛ زیپک؛ زیپکە؛ خڕکەبەرد؛ ورکەبەرد؛ وردکەبەرد؛ بەردەورتکە؛ خشبەرک؛ بەردی ورد بە ئەستووری چەند میلی‌میتر.

**سنگ‌زنی** / sangzanî/: *اسم.* بەردەساوی؛ کاری ساو و مشتوماڵ دانی شت، بەتایبەت کانزا و بەرد بە مەکینەگەلی جۆراوجۆری بەردەسماتەوە.

**سنگ‌سا** / sangsā ، ـها/: *اسم.* هەسان؛ بەردەهەسان؛ بەردەساو؛ بەراق؛ بەردێ کە بۆ تیژ کردنی کەرەسەی پێبڕ (وەک چەقۆ، قەیچی و...) بەکاردێ.

**سنگسار** / sangsār/: *اسم.* ڕەسخ؛ بەردەباران؛ بەردباران؛ کوچکواران؛ سەنگەسار؛ سەنگباران؛ کارەڕەهاتی کەڤراندن؛ هاویشتنی لە سەر یەکی بەرد بەرەو کەسێ یان شتێک. هەروەها: **سنگسار کردن**

**سنگسر** / sangsar ، ـها/: *اسم.* سەنگسەر؛ جۆرێ ماسی پانی خواردەمەنی ئاوی سوێرە، بە ڕەنگی سەوزی ئاماڵ خۆڵەمێشی: **ماهی سنگسر**

**سنگسری** / sangsarî/: *اسم.* سەنگسەری؛ لە زمانەکانی ئێرانی ڕۆژاوایی کە هێشتا دە بڕێ شوێنانی پارێزگای سمنان لە ئێراندا باوە.

**سنگ‌شکن** / sangšekan ، ـها/: *اسم.* سەنگ‌شکێن؛ بەردشکێن؛ کەولەشوانە؛ بنێکی کورتەبالای ناوچەگەلی شێدارە، بە گەڵای ئەستوور و جوان و تووکن، هێشووگوڵی گچکەی بەهاری و تۆوی وەک مرواریەوە کە جۆرێکی لە ماڵان بەخێو دەکەن و بۆ مەبەستی بژیشکیش بە کەڵک دێ.

**سنگ شناسی** / sangšenāsî/: *اسم.* بەردناسی؛ لقێک لە زانستی زەویناسی کە لە چۆناوچۆنی پێکهاتنی بەرد و پێکهاتەی کیماوی و بیچمی فیزیایی و ڕیزبەندیان دەکۆڵێتەوە.

**سنگفرش** / sangfarš ، ـها/: *اسم.* وشکەسی؛ نەتک؛ سەنگ‌فەرش؛ بەردەڕێژ؛ سەلبەند؛ ڕەقف؛ شوێنێ کە بە توێژێ لە بەرد داپۆشراوە.

**سنگ‌قلاب** / sangqollāb/: [فارسی/ عربی] *اسم. [گفتاری]* قەڵماسک؛ قەڵماسنگ؛ قەڵماسن؛ قاڵماسک؛ قاڵماسکە؛ چۆکێشمان؛ بەرەقانی؛ مەزرەقانێ؛ لاستێق؛ قۆچەقانی؛ کەهنیک؛ ئامرازێک بۆ هاویشتنی بەرد، پێکهاتوو لە پارچە، چەرم یان پەڕۆیەکی ئەستوور کە دوو سەری بە دوو پەتەوە بەسراوە.

▣ **سنگ‌قلاب کردن**: *[مجازی]* لە کۆڵ خۆ کردنەوە؛ لە مل کردنەوە و هەناردن بۆ جێگایەکی‌تر.

**سنگک** / sangak ، ـها/: *اسم.* سەنگەک؛ سەنگەکی؛ سەنگەکیە؛ نان کوچگی؛ نانی درێژ و سێ گۆش کە لە سەر چەوی سوورەوەبوو دەبرژێ.

**سنگ کار** / sangkār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سەنگ‌کار؛ بەردکار؛ کەسێ کە بە بەردی خانووسازی کار دەکا بەتایبەت ئەوەی بە جوانی لە پێکهاتەیکدا دەیخاتە پەنایەک.

**سنگ کاری** / sangkārî/: *اسم.* سەنگ کاری؛ بەردکاری؛ کاری بەردکردن.

**سنگ کره** / sangkore/: [فارسی/ عربی] *اسم.* پۆشەنی بەردینی گۆی زەوی کە وەک توێکڵێکی ڕەق دەوری ناوەکی زەوی داوە.

**سنگکی** / sangakî/: *صفت.* سەنگەکی؛ پێوەندیدار بە نانی سەنگەک ‹نانوایی سنگکی: نانەواخانەی سەنگەکی›.

**سنگلاخ** / sanglāx/: *اسم.* بەردەلان؛ بەردانی؛ بەرداوی؛ ڕێخەلان؛ ڕێخناخ؛ زاخان؛ زبران؛ شاوان؛ شەهوان؛ شکار؛ تم‌تمان؛ تم‌تم؛ تم‌تمەن؛ ڕەقانە؛ ڕەقەن؛ چەقەن؛ زورن؛ زوورک؛ کەمەرن؛ کەڤرە؛ کەڤری؛ کەڤرۆک؛ کەڕە؛ کەرە؛ گەر-گەر؛ گێڕ-گێڕ؛ بەرد بەردکوو؛ گیڕ؛ وڕە؛ سیتک؛ سێتەک؛ تەقتەق؛ قۆمز؛ زەوینی داپۆشراو لە بەردی گەورە و بچووک.

**سنگنبشته** / sangnebešte ، ـها/: *اسم.* بەردەنووس؛ بەردەنووشتە؛ نووسراوەیەک کە بە ڕووی بەردەوە هەڵکۆڵراوە: **سنگنوشته**

**سنگ‌نگاره** / sangnegāre ، ـها/: *اسم.* وێنەبەردینە؛ وێنە یان نووسراوەی زۆپی بەسەر بەردەوە هەڵکەنراو.

**سنگنوردی** / sangnavardî/: *اسم.* شاخەوانی؛ بەردەوانی؛ زەردەوانی؛ کار و وەرزشی بە ڕێگای تات و تیشە شاخاندا سەرکەوتن.

**سنگنوشته** / sangnevešte/ ☜ **سَنگنِبشته**

**سنگواره** / sangvāre ، ـها/: *اسم.* کەلەخەبەرد؛ لاک؛ قاپێلکی؛ لەش یان پاشماوەی گیانەوەر یان گیای کەڤنارا کە لە نێو نیشتەگەلی زەویدا ماوەتەوە.

**سنگی** / sangî/: *صفت.* بەردی؛ بەردین؛ کوچکی؛ تەوەنی؛ کوچکین؛ تەوەنین؛ تەوەنینە؛ لە بەرد چێبوو ‹خانەی سنگی: ماڵی بەردین›.

**سنگین** / sangîn/: *صفت.* سەنگین؛ گران: ١. قورس؛ بەکێش؛ سەنگدار؛ بسەنگ ‹بار سنگین: باری قورس› ٢. تۆکمە؛ قورس؛ بە کێشێکی تایبەت یان تۆڵای زۆرەوە ‹آب سنگین: ئاوی گران› ٣. *[ادبی]* بەردین؛ تەوەنین؛ لە جنسی بەرد ‹تبر سنگین: بیوری بەردین› ٤. *[مجازی]: الف)* قورس؛ دژوار؛ ئاستەم؛ لە بواری هەڵکردنەوە ‹خرج سنگین: خەرجی سەنگین› ب) قورس؛ ئەستەم لە بواری هەڵتاواندن ‹عبارتهای سنگین: سارستەگەلی گران› ٥. *[مجازی]* بەبێ ژنەوایی باش یان بەسندە ‹گوش سنگین: گوێی گران› ٦. *[مجازی]* قورس؛ لە سەرخۆ ‹رفتار سنگین: ئاکاری سەنگین› ٧. *[مجازی]* قورس؛ یەکجار زۆر یان گەمرە ‹خواب سنگین: خەوی قورس› ٨. *[مجازی]* قورس؛ بەنرخ ‹هدیەی سنگین: دیاری سەنگین›. هەروەها: **سنگین بودن؛ سنگین کردن؛ سنگین شدن**

**سنگین‌ورنگین**[1] / sangîn-o-rangîn/: *صفت.* *[مجازی]* ڕێک‌وپێک؛ گران و جوان؛ ڕێک و لەبار؛ سەنگین و ڕەنگین؛ سەنگ‌وڕەنگ؛ لە سەر خۆ؛ ڕازاوە و ڕێک‌وپێک ‹رفتارش خیلی سنگین و رنگین بود: ئاکاری زۆر ڕێک‌وپێک بوو›.

**سنگین‌ورنگین**[2]: *قید.* ڕێک‌وپێک؛ گران و جوان؛ ڕێک و لەبار؛ سەنگین و ڕەنگین؛ سەنگ‌وڕەنگ؛ موورک و مایە ‹آمد، سنگین و رنگین حرفش را زد و رفت: هات، ڕێک‌وپێک قسەی خۆی کرد و ڕۆیی›.

**سنگینی** / sangînî/: *اسم.* گرانایی؛ قورسایی؛ سەنگینی؛ سۆڤ؛ قورسی؛ کولپ: ١. مەوورک و مایە؛ دۆخ یان چۆنیەتی قورس و سەنگین بوون ٢. کێش؛ سەنگ.

▣ **سنگینی قیمت:** گرانی؛ نرخ‌گرانی.

**سنگینی گوش:** گوێ گرانی؛ گوێچکە سەنگینی.

**سنگینی وزن:** زۆری قورسایی؛ قورسی.

**سنگینی ویژه:** چڕی؛ تۆلایی؛ تۆکمەیی.

▣ **سنگینی کردن:** سەنگینی‌کردن: ١. بار

قورسی کردن؛ بارگرانی کردن؛ بە وەزنی خۆ گوشاردانی شتێ یان شوێنێ ‹کولەپشتی روی شانەهایم سنگینی می‌کند: کۆلەپشتی بە سەر شانمەوە سەنگینی دەکا› ٢. [مجازی] باری گران بوون؛ بوونە هۆی ڕەنج و جخار ‹غم دوری او روی دلم سنگینی می‌کرد: دەردی دووریەکەی لە سەر دڵم سەنگینی دەکرد›.

**سنن** / sonan/: [عربی] جمعِ ☜ **سُنَّت**

**سنوات** / sanavāt/: [عربی] جمعِ ☜ **سَنه**

**سنواتی** / sanavātî/: [عربی] *صفت*. سالانە؛ سالیانە.

**سنوزوئیک** / senozo'îk/: [فرانسوی] ☜ **نوزیوی**

**سن‌وسال** / sen-o-sāl/: [عربی/ فارسی] *اسم*. *[گفتاری]* تیروتەمەن؛ ساڵ و تەمەن؛ ماوە و مەودای ژیان ‹مادربزرگ سن و سال زیادی داشت: داپیرە تیر و تەمەنێکی زۆری هەبوو›.

**سنه** / sane ، سنوات/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* ساڵ؛ ساڵە.

▣ **سنه‌ی جِرت‌مَائه**: *[تعریض]* ساڵی بەفرە قورسەکە؛ ساڵی چۆلەکەزۆرەکە؛ زەمانی ڕابردووی ناڕوون.

**سنه‌ی قمری**: ساڵی مانگی؛ ساڵی هەیڤی.

**سنی** / sennî/: [عربی] *صفت*. تەمەنی؛ پێوەندیدار بە هەندی تەمەنەوە.

**سنی** / sonnî ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت*. سوننی؛ شوێن‌کەوتووی یەک لە چوار مەزهەبی ئەهلی سوننەت ‹مسلمان سنی: موسوڵمانی سوننی›.

**سنین** / senîn/: [عربی] جمعِ ☜ **سن**

**سنیور** / senyor/: [؟] ☜ **سینیور**

**سو** / sû/: *اسم*. ١. لا؛ ئالی؛ لایەن؛ لایین؛ هاویر؛ نک؛ نکال؛ ئاتەک؛ لای خاڵی ئاماژەپێکراو ‹سوی شمال: لای باکوور› ٢. سۆما؛ هەتەر؛ هانا؛ سۆ؛ ڕووناکی؛ نوور ‹سوی چشم: سۆمای چاو›.

**سوآل** / so'āl ، ـها/: [عربی] *اسم*. ١. ـات/ پرسیار؛ ویستە ‹سوآل امتحانی: پرسیاری ئەزموونی› ٢. *[ادبی]* فەقیری؛ گەدایی؛ سواڵکەری ✽ **سؤال**

▣ **سوآل دادن**: پرسیار دان؛ دیاری کردنی پرسیار بۆ ئەزموونده‌ر ‹ده تا سوال داده بودند که جواب همه را نوشتم: دە دانە پرسیاریان دابوو کە وەرامی هەموویم نووسی›.

**سوآل شدن**: پرسیارکران ‹از متهم درباره‌ی شب حادثه سوال شد: لە تاوانبار لە بارەی شەوی ڕووداوەکەوە پرسیار کرا›.

**سوآل کردن**: ١. پرسین؛ پرس کردن؛ پرسیارکردن ‹از او سوال کردم که آیا متهم را می‌شناسد: لێم پرسی تاوانبارەکە دەناسێ› ٢. *[ادبی]* گەدایی کردن؛ سواڵ کردن.

**سوآل‌پیچ** / so'ālpîč/: [عربی/ فارسی] *صفت*. *[مجازی]* بەر پرس کەوتوو؛ تایبەتمەندی کەسێ کە کەوتۆتە بەر تەوژمی پرسیاری یەک لە دوای یەکەوە.

▣ **سوآل‌پیچ کردن**: *[مجازی]* بەر پرس خستن؛ پرسیار پەرچێن کردن؛ یەک لە دوای یەک پرسیار لێ کردن؛ بێ‌وچان لێ پرسین. هەروەها: **سوآل‌پیچ شدن**

**سوآل‌وجواب** / so'āl-o-cavāb/: [عربی] *اسم*. ١. ـها/ پرسیار و وەرام؛ پرسیار و پەرسف ٢. *[گفتاری]* قسەوباس؛ وت و وێژ؛ هەڤپەیڤین ‹برو این پول را بگذار و بیا! سوال و جواب هم لازم نیست بکنی: برۆ ئەم پارە دانەو بگەڕەوە! قسەوباسیشی ناوێ›.

**سوا** / savā/: [عربی] *صفت*. *[گفتاری]* جیا؛ جیاواز؛ جگا؛ جودا؛ جیاگ. هەروەها: **سوا بودن؛ سوا شدن؛ سوا کردن**

▣ **سوای**: بێجگە؛ بێژگە؛ بێجگەلە؛ جگە لە؛ جیا لە ‹سوای من، چند نفر دیگر هم بودند: بێجگە من، چەند کەسێکی دیکەش هەبوون›.

**سوابق** / savābeq/: [عربی] جمعِ ☜ **سابقه**

**سواحل** / savāhel/: [عربی] جمعِ ☜ **ساحل**

**سواحلی** / savāhelî/: [عربی]/اسم. سه‌واحلی: ١. /ها؛ ان/ هه‌ریه‌که له خه‌ڵکی کناره‌کانی زه‌نگبار و ناوچه‌گه‌لی ده‌ور و به‌ری ٢. له زمانگه‌لی بانتو، که زمانی ڕه‌سمی زۆربه‌ی ناوچه‌گه‌لی ڕۆژهه‌ڵاتی ئه‌فریقا و ده‌ور و به‌ری کونگۆیه.

**سواد** / savād/: [عربی]/اسم. سه‌واد؛ سیوا: ١. خوێنده‌واری؛ خۆنه‌واری؛ خوه‌نه‌واری؛ توانایی خۆندن، نووسین و حه‌ساوکردن ٢. /کنایی/ زانیاری؛ ئاگه‌داری؛ تێگه‌یشتوویی زانستی و ئه‌ده‌بی ‹معلم ما سواد خوبی دارد: ماموستاکه‌مان زانیاریه‌کی باشی هه‌یه› ٣. خۆنه‌واری؛ خوێنده‌واری؛ خوێندنی مه‌دره‌سه‌یی ‹سواد ابتدایی: خوێنه‌واری سه‌ره‌تایی› ٤. /قدیمی/ فه‌رک؛ ڕوونووس؛ نووسراوه‌یێ که ده‌قاوده‌ق له ڕووی نووسراوه‌یێ‌تر هه‌ڵگیراوه.

◘ **سواد کسی نم کشیدن**: /مجازی/ سه‌وادی که‌سێ که‌ڕوو هێنان؛ سه‌واد که‌سێ دووکه‌ڵ کردن؛ که‌م خۆنه‌وار بوون؛ خوێنده‌واری ئه‌وتۆ نه‌بوون ‹مثل این‌که سواد تو هم نم کشیده است!: وا دیاره سه‌واده‌که‌ی تۆش که‌ڕووی هیناوه!›.

**سوادآموز** / savādāmûz، ـها؛ ان/: [عربی/ فارسی]/اسم. نۆفێر؛ نۆمس؛ که‌سێ که تازه خوێندن و نووسین فێر ده‌بێ.

**سوادآموزی** / savādāmûzî/: [عربی/ فارسی] /اسم. نۆفێری: ١. کار یان ڕه‌وتی فێربوونی سه‌واد ٢. کار یا ڕه‌وتی فێرکردنی سه‌واد به خه‌ڵک.

**سوار** [1] / savār، ـها/: /اسم. سوار؛ سیار؛ سویار: ١. /ها/ که‌سێ که به سه‌ر ئه‌سپه‌وه ڕۆنیشتووه یان ئه‌سپ سواری ده‌کا ٢. هه‌ر یه‌که له مۆره‌گه‌لی شه‌ترەنج، جگه له شا و پیاده.

**سوار** [2]: صفت. سوار؛ سیار؛ سویار: ١. له سه‌ر یان ده نێو پێگۆزێکدا (وه‌ک ماشێن، فڕۆکه و...) بوون ٢. دانراو و دامه‌زراو به سه‌ر شتێکه‌وه ٣. /مجازی/ زاڵ؛ چیر به سه‌ر که‌سێ، شتێ یان کارێکدا.

◘ **سوار شدن**: سوار بوون: ١. وه‌نشتا؛ وه‌نشتش؛ سه‌رکه‌وتن؛ له سه‌ر یا له‌نێو پێگۆزێکدا بوون ‹ماشین سوار شدن: ماشێن سوار بوون› ٢. دامه‌زران؛ مونتاژ بوون؛ به‌سه‌ر شتێک یا شوێنێکه‌وه نران ٣. /مجازی/ زاڵ بوون ‹نگران نباش! بعد از یک سال سوار کار می‌شوی: مه‌ترسه‌! دوای ساڵێک به سه‌ر کاره‌که‌دا زاڵ ده‌بی›.

**سوار کردن**: ١. سوار کردن؛ سه‌ر خستن؛ له سه‌ر یا ده نێو پێگۆزێکدا دامه‌زراندن ‹او را هم سوار ماشین کرد: ئه‌ویشیان سواری ماشین کرد› ٢. دانان ‹یک نگین الماس رویش سوار کرده بودند: مۆرخانه‌یه‌کی ئه‌ڵماسیان له سه‌ر دانابوو› ٣. سوار کردن؛ خستنه سه‌ر یه‌ک؛ مونتاژ کردن ‹قطعات را سوار کردم: پاژه‌کانم سوارکرد›.

**سوار کسی شدن**: /مجازی/ سوار کۆڵ/ مل که‌سێ بوون؛ شێره بوون به مل که‌سێکدا؛ سواروو یۆی بیه‌ی؛ به سه‌ر که‌سێکدا زاڵ بوون ‹سوار شریکش شده بود و او را می‌تازاند: سوار کۆل شه‌ریکه‌که‌ی ببوو غارغارێنی پێ ده‌کرد›.

هه‌روه‌ها: **سوار کسی بودن**

ـ **سوار** [3]: پیواژه. ـ سوار: ١. خاوه‌نی جۆرێک پێگۆز ‹دوچرخه‌سوار: دووچه‌رخه‌سوار› ٢. خاوه‌ن کارامه‌یی له سواریدا ‹یکه‌سوار: شۆڕه‌سوار›.

**سوارکار** / savārkār، ـها؛ ان/: صفت. سوارکار؛ سوار؛ سواره؛ هه‌لینگده‌ر؛ شۆڕه‌سوار؛ سووکه‌ڵه‌سوار؛ سووکه‌له‌سوار؛ لێهاتوو ده ئه‌سپ سواریدا. هه‌روه‌ها: **سوارکاری**

**سواره** / savāre/: قید. به سواری؛ سواره؛ سیاره ‹سواره از آنجا گذشت: به سواری به‌وێدا تێپه‌ڕی›.

**سواره‌رو** / savārerow, -ro/: ، ـها/: /اسم. ماشێن‌ڕۆ؛ سواره‌ڕۆ؛ به‌شێ له ڕێ که تایبه‌تی تێپه‌ڕینی پێگۆزه.

**سواره‌نظام** / savārenezām، ـها/: [فارسی/ عربی]

*اسم.[قدیمی]* سوارەی بادەران؛ چەکداری سوار؛ دەستەی سواران؛ بەشێ لە سوپا کە لە سەر ئەسپەوە دەچوونە شەڕ.

**سواری**[1] / savārî/: *اسم.* سواری: ١. سیاری؛ سویاری؛ کاری سوار بوونی پێگۆزێک و هاتوچۆ پێ کردنی ‹مدتی سواری کردیم: ماوەیەک سواریمان کرد› ٢. بار یان چۆناوچۆنی سوار بوون ‹سواری این ماشین حرف ندارد: سواری ئەم ماشێنە زۆر خۆشە›.

◘ **سواری دادن:** سواری پێدان؛ کۆڵی دان: ١. خەڵک هەڵگرتن و جێبەجێ کردن ‹این اسب چند سال به ما سواری داد: ئەم ئەسپە چەند ساڵ سواری پێداین› ٢. *[مجازی]* کۆلکێشی کردن؛ بوونە کۆلکێش؛ کۆڵ دان ‹اگر به این مردم سواری بدهی کارت زار است: ئەگەر بەم خەڵکە سواری بدەی حاڵت شڕە›. هەروەها: **سواری گرفتن**

**سواری**[2] / ـها/: *صفت.* سواری؛ سیاری؛ سویاری؛ لە بار بۆ سوار بوون ‹اتومبیل سواری: ماشێنی سواری›.

**ـ سواری**[3]: *پیواژە.* ـ سواری؛ ـ سیاری؛ ـ سویاری؛ کار یان ڕەوتی سوار بوون ‹اسبسواری: ئەسپسواری›.

**سوانح** / savāneh/: [عربی] جمعِ ☜ **سانِحه**

**سوء** / sû'/: [عربی] *صفت.[ادبی]* بەد؛ ناڕەوا؛ گەست؛ گەس؛ خراپ؛ گەن؛ خراو؛ دزێو؛ کرێت.

◙ **سوء استفاده:** کەڵک وەرگری بە ناڕەوا و نادروست.

**سوء پیشینه** ☜ **سوء سابقه**

**سوء تغذیه:** بەدبژیوی؛ گەنەخۆری؛ خراپی یان کەم بوونی خۆراکێ کە دەخورێ ‹نیمی از کودکان و مادران از سوء تغذیه رنج می‌برند: نیوەی منداڵان و دایکان لە بەدبژیویدا دەتلێنەوە›.

**سوء تفاهم:** لێک تێنەگەیشتویی؛ خراپ تێگێشتوویی؛ ڕەنجیانی لە بەر لێک تێنەگەیین.

**سوء سابقه:** پێشینە؛ بەدناوی؛ بەوناوی؛ کار یان کردەوەی ناڕەوا یان پێچەوانەی قانوون لە لایەن کەسێکەوە کە پێشتر بەوە ناسراوە: **سوء پیشینه**

**سوء ظن:** خانەگومانی؛ بەد گومانی (بۆ ژن و مێرد لە حاندی یەکتردا) ‹نسبت به زنش دچار سوء ظن شده بود: بە ژنەکەی خانەگومان ببوو›.

**سوء قصد:** کردەوەیەک بۆ کوشتنی کەسێ.

**سؤال** / so'āl/: [عربی] ☜ **سوآل**

**سوئیت** / sû'ît/: [فرانسوی] *اسم.* سویت: ١. /ـها/ وارخانێکی بچووک کە دیوی جیاوازی نیە ٢. ناوی گشتی بۆ بەش‌بەشی مووسیقای سازی ڕۆژئاوا: **سویت**

**سوئیچ** / sû'îč/: [انگلیسی] ☜ **سویچ**

**سو بر تری** / sûbartarî/: *اسم.* لاسەری؛ سەرتر بوونی لایەکی ئەندامانی لەش لە چالاکی و لێهاتوویدا (وەک دەستی چەپ یان دەستی ڕاست). بەرانبەر: **دوسوتوانی**

**سوبژکتیو** / sûbjektîv/: [فرانسوی] *صفت.* زەینی؛ هزری؛ هشی.

**سوبژکتیویسم** / sûbjektîvîsm/: [فرانسوی] *اسم.* زەینیخوازی؛ هزری‌خوازی؛ ئامۆژەیێ کە تەنیا بایەخ بە زانیاریگەلی زەینی دەدا و بەس.

**سوبسید** / sûbsîd ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* یارانە؛ سوبسید؛ یارمەتی ماڵی دەوڵەت بۆ دابین‌کردنی کەل‌وپەلی پێویستی هەموانی بە هەرزان و بەرگری لە گران‌بوونیان.

**سوپ** / sûp/: [فرانسوی] *اسم.* سووپ؛ شۆربا؛ شۆرباو؛ شلە؛ چێشتی تەڕ بریتی لە گۆشتی مریشک، سەوزی و جاروبارەش پەڕشتە.

**سوپاپ** / sûpāp ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* سووپاپ؛ گولێنە؛ گۆلۆ؛ گولۆنە؛ گولۆینە؛ ئامێرێ کە گەڕیانی تەوشێک (تراو، گاز و...) لە نێو دەستگایەکی لوولەئاسادا ڕادەگرێ.

**سوپخوری** / sûpxorî ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]

*اسم.* سـووپخۆری؛ دەفـری دەرخۆنـەدار کـە چێشتی تێدەکەن و دەیهێننە سەر سفرە.

**سوپر** [1] / sûper ، ـها/: [انگلیسی] *اسم. [مخفف]* سووپیر؛ سووپرمارکت.

**سوپر** [2]: [فرانسوی] *صفت.* سووپێر؛ هـەرەباش؛ بـێ کەم و کووڕی.

**سوپرانو** / sûperāno/: [ایتالیایی] *اسم. [موسیقی]* زیکترین دەنگی ژنی گۆرانیبێژ.

**سوپرسونیک** / sûpersonîk/: [فرانسوی] *صفت.* ژوورە دەنـگ؛ ژووررووی دەنـگ؛ زیکتـر لـەوەی ببیسرێ.

**سوپرمارکت** / sûpermārket ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* سووپرمارکت؛ فرۆشگای گەورە کە چاوەی زۆری بۆ ڕانانی شتومەک هەیە.

**سوپری** / sûperî ، ـها/: [انگلیسی] *اسم. [گفتاری]* ١. خـاوەن یـان فرۆشـیاری سـووپرمارکت ٢. سووپرمارکت.

**سوت** / sût ، ـها/: *اسم.* ١. فیـت؛ فیتـوو؛ فیتـە؛ فیقە؛ فیک؛ فیکە؛ فینکە؛ شیتە؛ شیت؛ پیپیـک؛ ویتـوو؛ دەنگـی زیکـی نـاو دوولێـو، لـە کـاتی دەردانی هەوا ٢. فیـزە؛ هاشـە؛ هووشـە؛ هـاژە؛ کشە؛ ویزە؛ لوەش؛ دەنگی باریک و تیژ بە هۆی تێپەڕینی هەوا بـە درزێکـدا ٣. فیتـک؛ فیتکـە؛ فیفکـە؛ فیتفیتـە؛ فیقفیقـە؛ فیقنـە؛ فیقەنـە؛ فیـزۆک؛ فیزفیـزۆک؛ ماسـوولە؛ شـیتەک: *الف)* ئـامێرێکی بـایی بـە شـێوەی لوولەیـەکی بچووک بـە دوو کونـەوە کـە بـە فووکردنـە نێـو یەکیانـەوە، دەنگێکـی زیـق و تیـژی لـێ بـەرز دەبێتەوە *ب)* ئامێرێ کە بـە هـۆی فـت بـوونی هەوا یان هەڵم لە ڕەهۆڵ و کـەلێنی، دەنگێکـی بڵێندی لێ هەڵدەستێ.

▣ **سوت بلبلی**: فیکـە بولبـولی؛ فیقـەی وەک چریکاندنی بولبول.

▣ **سـوت زدن**: فیکانـدن؛ فیکـانن؛ فیکـەنن؛ فیقانـدن؛ فـیکین؛ یاسـاین؛ فیکەکێـشان/ کێشای؛ فیقەکێشان؛ فیتو لێدان؛ فیکـەکرن؛ شووت کێشان ‹داور سوت زد و پایان بازی را اعلام کـرد: داوەر فیکـەی کێـشا و کۆتـایی کایـەی ڕاگەیاند›.

**سوت کردن**: *[گفتاری]* تووڕ دان؛ فڕە دان؛ بڕک دان؛ فڕک دان؛ لوورە دان ‹کلاهم را سوت کرد بالای درخت: کلاوەکەمی توور دایە سەر دارەکە›. هەروەها: **سوت کشیدن**

**سـوت کـشیدن**: فیکـە کێـشان/ کـردن: ١. فیکانـدن؛ فیکـانن؛ فیقانـدن؛ فـیکین؛ کووفین؛ یاساین؛ شووت کێشان ‹مـردم سوت می‌کشیدند: خەڵـکی دەیانفیکانـد› ٢. *[مجازی]* شـووت کێـشان؛ دەنگێکـی وەک فیکـە لێ‌هەستان ‹گوشم سوت مـی‌کـشد: گـوێم فیکـە دەکیشی›.

**سوت‌سوتک** / sûtsûtak ، ـها/: *اسم.* فیـک‌فیکـە؛ فیـت؛ فیتـوو؛ فیکـە و کونـا؛ فیکـەکونێ؛ فیکەواکونا؛ فیکەوەکونێ؛ لیستۆکێکی هلۆل بـە شێوەی مەلێ بە دوو کونەوە کە ئاوی تێدەکـەن و کە فووی پێدا بکەن دەنگێکی وەک چریکەی مەلان بە دی دێت.

**سوتک** / sûtak/: *اسم. [موسیقی]* جـۆرە سـازێکی بایی چێوی وەک فلووت بە دە کوناوە.

**سوت‌وکور** / sût-o-kûr/: *صفت. [گفتاری]* قڕوقپ؛ کـپ‌وکـڕ؛ بـێ‌هەسـت و خوسـت؛ بـێ‌دەنـگ؛ مات‌ومت؛ مامش؛ مـات؛ مـت؛ مـات و مـەلوول ‹وقتی برگشتم، همه رفته بودند و خانه سوت و کور بـود: کاتێ گەڕامەوە، هەموو ڕۆیشتبوون و ماڵ قـڕ و قـپ بوو›.

**سـوتی** / sûtî ، ـهـا/: *اسم. [گفتـاری]* چۆنیـەتی جووڕیان؛ هەڵەی زمان؛ تەتەڵە کردن.

**سـوتیتر** / sutitr ، ـهـا/: [؟] *اسم.* لاسـەردێڕ؛ سەردێڕی لاتەکی.

**سـوتین** / sûtiyan ، ـهـا/: [فرانسوی] *اسم.* ☜ **سینەبند**

**سـوخ** / sûx ، ـهـا/: *اسم. [گیاه‌شناسی]* سـەلک؛ کەسخ؛ کخس؛ خیسکە؛ خسکە؛ لاسـکی خـڕ و کورتی ژێرزەوینی برێ ڕووەک.

**سـوخاری** / soxārî, sûxārî/: *[روسـی]/اسـم.* سووخاری: ١. *ـها/* نانی چەند لەت‌کراو و بـرژاو ٢. بریان؛ براشتی؛ بریژیا؛ بورش؛ هـەر چەشـنە خواردن، بەتایبەت گۆشـتی بـرژاوی مریـشک و ماسی.

**سوخت** / sûxt/: *اسم.* شـەوتەک؛ سـووتەمەنی؛ سـووتەنی؛ کلـە؛ ئـاوردوو؛ ئـاردوو؛ واردوو؛ ئاگوردی؛ سووت؛ سۆخت؛ سوخت؛ کار بـووران: ١. *ـها/* ماکێ کە لە سـووتانی، گـەرما یـان وزە بەرهەم دێ ٢. ماکـێ کـە لێـوە وزەی ئـەتومی بەرهەم دێ، بەتایبەت لە ڕیاکتوردا ٣. *[مجازی]* سووتە؛ سۆتی؛ ئەوەی تیا دەچێ.

▣ **سوخت زمستانی:** ئازاڵـە؛ ئاژاڵـە؛ سـووتەمەنی تایبەتی وەرزی زستان.

▣ **سوخت شدن:** *[مجازی]* سووتان؛ فەوتان؛ فـت بوون؛ تیـا چـوون؛ لـە نـاو چـوون؛ سـۆتەی؛ سووچان؛ سۆچیای ‹تمام داراییم سوخت شد و چیزی دستم را نگرفت: هـەموو سـامانم سـووتا و شتێکم گیر نەکەوت›.

**سوخت‌آما** / sûxtāmā/ ☜ **کاربُوراتُور**

**سـوختپاش** / sûxtpāš ، ـهـا/: *اسم.* سـووتپاش؛ سووتپژ؛ سووتپژێن؛ کەرستەیەک لە موتور یـان ماشینی گەرماییدا کە سووتەمەنی بە تەوژمـەوە دەپژێنێتە نێو موتۆرەوە.

**سـوختگی** / sûxtegî ، ـهـا/: *اسم.* سـووتاوی؛ سـووتیاگی؛ سـووچیایی؛ سـچیایی؛ شـوێنەوار سووتان ‹جای سوختگی: جێی سووتاوی›.

**سـوختن** / sûxtan/: *مـصدر. لازم. //* **سـوختی:** سووتای؛ **می‌سوزی:** دەسووتی؛ **بِسوز:** بسووتێ// سووتان؛ سووتیان؛ سـۆتان؛ سـۆچان؛ سـووچان؛ سـۆچیان؛ سـۆچیای؛ سـووچیای؛ سـچیان؛ سووزان؛ سـووزیان؛ سـۆزان؛ سـۆزیان؛ سـۆژان؛ سـۆژین؛ سـووژیان؛ سـۆتن؛ سـۆتەی؛ سـۆهتن؛ سـووتن؛ شـووتان؛ شـەوتین؛ شـەوتان: ١. گـڕ گرتن/ گرتەی؛ هەڵگڕان؛ پاتن؛ ئاور بردن؛ ئـاگر تێبەر بوون؛ ئاگر تێچوون؛ ئاگر گرتن؛ بـە هـۆی گڕ، لێکخشان یان هۆکاری‌ترەوە، تێکـەڵ بـوون لەگەڵ ئوکسیژن و بوونە گەرما، ڕوونـاکی، گـاز، سوخاڵ یان خۆڵەمێش ‹سوختن نفت: سووتانـی نەوت› ٢. *[گفتاری]* داگرسان؛ داگرسیان؛ گـڕیان؛ هەڵبوون؛ ڕۆشن بوون؛ ئەنەگیسیەی؛ گیسیاینە؛ گڕەی؛ گڕای ‹سوختن چراغ: سووتانـی چرا› ٣. لـە بەر گەرما یان لێکەوتنی شۆڵە یـان ئـاگر زیـان دیـتـن ‹سـوختن دسـت: سووتانـی دەسـت› ٤. *[مجازی]* سووتانەوە؛ سـووتیانەوە؛ سۆڵـیانەوە؛ ئەوەکزیـەی؛ کزیـایوە؛ کزیانـەوە؛ کووزیـان؛ سـووزانەوە؛ کووزانـەوە؛ کۆڕیانـەوە؛ چووزانـەوە؛ سووزیانەوە؛ کاویانەوە ‹گلویم می‌سوزد: گـەرووم دەسـووتێتەوە› ٥. *[مجـازی]* لـە کـار کـەوتنی کەرەستەیەکی کارەبـایی بـە هـۆی دارزان یـان تێکچوون ‹سوختن یخچـال: سووتانـی یەخـەچاڵ› ٦. *[مجازی]* تووشیاری جخاری دژوار بوون ‹دلـم سـوخت: دلـم سـووتا› ٧. *[مجـازی]* گـڕگرتن؛ هەڵـگڕان؛ داگرسـان؛ ئەیرگێرتـەی؛ تەریـقین؛ هەڵپفان؛ ئاران؛ یەکجار تووڕە بوون؛ ئاگر تێبـەر بوون؛ ئاگر تێچوون؛ ئاور تێچوون؛ هەڵچوون ‹از این حرف من سوخت: لـەم قسەیەم گـڕی گـرت› ٨. *[کنایی]* فەوتان؛ تیا چوون؛ ئاگر تێبـەر بـوون؛ ئـاگر تێچـوون ‹تمام سرمایه‌اش سوخت: تـەواوی دەسمایەکـەی سـووتا› ٩. *[مجـازی]* فـت بـوون؛ هەڵەکردن یان دۆڕاندن لە گەمەی بە کۆمەڵـی مندالانـەدا ‹برو بیرون، تو سوختی: بچـۆ دەرەوە، سووتای›. هەروەها: **سوختنی**

■ صفت فاعلی: **سوزنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **سوخته** (سووتاو)/ مصدر منفی: **نَسوختن** (نەسووتان)

▣ **سوختن و ساختن:** *[مجازی]* کـردن و سـاچان؛ ڕەنج‌کێشان و هەڵکردن.

**سوخت‌وساز** / sûxt-o-sāz/: *اسم. [زیست‌شناسی]* سووت و ساز؛ ڕەوتی فیزیایی و کیمیاوی ژینەوەر کە ماکی بژیوی وەردەگرێ، تێکەڵی دەکا، لێکی دەدا و دەیکاتە وزەی ژیان.

**سوخت‌وسوز** / sûxt-o-sûz/: *اسم. [گفتاری]* قت‌وفت؛ کار یان ڕەوتی سووتان؛ ماڵ تیا چوون؛ دارایی لە کیس چوون ‹معامله با او سوخت و سوز ندارد: مامەڵە لەگەڵیدا قت‌وفتی نیە›.

**سوخته**[1] / sûxte/: *اسم.* سووختە؛ ژەنگی تریاک کە وەک توێژێکی ڕەق بە دیوارەی وافوورەوە دەنیشێ.

**سوخته**[2]: *صفت.* ١. سووتاو؛ سووتیاگ؛ سۆتە؛ سۆتێ (بۆ مێ)؛ ڕەشەوە بوو بە هۆی سووتان ‹نان سوخته: نانی سووتاو› ٢. *[مجازی]* فەوتاو؛ سووتاو ‹طلب سوخته: قەرزی فەوتاو› ٣. تاڵ؛ تۆخ؛ ئاماڵ ڕەش ‹قهوه‌ای سوخته: قاوەیی تاڵ›.

**سود** / sûd/: *اسم.* ١. سوو؛ سوود؛ قازانج؛ قانجاز؛ قانزاج؛ کەڵک؛ کار؛ هاقڵ؛ باو؛ با؛ بەهرە؛ نەف؛ نەحف؛ نەهف؛ مەفا: *الف)* دەرامەد؛ داهات؛ داهاتێ کە لە دان و ستان یان سەرمایە دانان بەدەست دێ، بەتایبەت لە فرۆشتنی کالایەک بە نرخێ پتر لە نرخی تەواو بوو ‹سود خالص: سوودی پەتی› *ب)* فایدە؛ فێدە؛ ئاکامی باش و دڵخواز لە کارێ ‹سود این کار دادن آگاهی به مردم است: قازانجی ئەم کارە وریاکردنەوەی خەڵکە› *پ)* بەهرە؛ بێر؛ بارە؛ باهر ‹سود بانکی: سووی بانکی› ٢. فایدە؛ فێدە؛ ئاسەواری خۆش و دڵخوازی شتێک ‹سود این گونه زندگی چیست؟: بەهرەی ئەم جۆرە ژینە چیە؟› ٣. [فرانسوی] *[شیمی]* سوود؛ هیدروکسیدی سدیۆم.

◘ **سود خالص/ ویژه:** خێر/ قازانج/ سوودی پەتی/ تایبەت؛ ڕادەی زۆرتربوونی نرخی فرۆش لە نرخی سەندن و هەموو خەرجێکی لە سەر یەک.

**سود سپرده:** خێر/ قازانج/ سووی سپاردە؛ قازانجێ کە دەخرێتە سەر پارەیێک کە لە بانک دانراوە.

**سود سهام:** خێر/ قازانج/ سوودی بەشان؛ ئەو داهاتەی بەشدارگە کە لە نێوان خاوەنەکانیدا بەش دەکرێتەوە.

◘ **سود بردن/ کردن:** قازانج‌کردن/ بردن؛ خێر کردن؛ بەهرە پێ‌گەیشتن/ بردن؛ خەیرکردن؛ فێدەکردن/ بردن؛ هاقڵ بوون ‹از این کار سالی صد میلیون سود برده است: لەم کارە ساڵێک سەد میلیۆن قازانجی کردووە›. هەروەها: **سود داشتن**

**سود جستن:** بەهرە بردن؛ کەڵک وەرگرتن ‹از امکانات دیگران هم سود می‌جست: لە هەل و دەرفەتی خەڵکیش بەهرەی دەبرد›.

**سودآور** / sûdāvar/: *صفت.* خێرەودەر؛ قازانج‌دەر؛ خێردەرەوە؛ خێرەودا؛ سوودهێنەر ‹فعالیتهای سودآور: کار و باری خێرەودەر›.

**سودآوری** / sûdāvarî/: *اسم.* کەڵکدەری؛ خێرەودەری؛ قازانجدەری؛ بار و دۆخی قازانجدەر بوون؛ سوودهێنی ‹تازه کارخانه به سودآوری رسیده است: تازە کارخانە گەیشتۆتە کەڵکدەری›.

**سودا** / sowdā, so:dā/: *اسم.* سەودا: ١. دان‌وستان؛ دان‌وسان؛ کڕین و فرۆتن؛ داوپسین؛ داوستە؛ ئاڵ و وێر؛ داوستەد؛ مامەڵە؛ داوپسەت ‹با بدعهدان سودا نکنید: لەتەک بێ‌بەڵێناندا سەودا مەکەن› ٢. [عربی] *[روان‌شناسی]* *الف)* مەراق؛ هەڵشڵەژاوی ڕەوان و تێکچوونی هۆشی ئادەمیزاد بە هۆی ماتەمینیەوە، کە ئەبێتە هۆی خرۆشانێکی گشتی لەو کەسەدا کە لە خۆیەوە پێدەکەنێ و ئەگری و لە دواییدا مات دەبێ *ب)* گەللایی؛ هووکی؛ هۆکی؛ مالیخولیایی؛ میلانخۆلی؛ ماخۆلان؛ واسواسی؛ وەسواسی ٣. [عربی] *[مجازی]* خەیاڵ؛ گز؛ شەقڕەشک؛ هەوا ٤. [عربی] *[قدیمی]* لە چوارهیمی سەرەکی

سروشتی مرۆڤە کە وایان دەزانی لە سپڵدا پێکدێ ٥. [عربی]/[مجازی] بیرۆ؛ گەزەنەک؛ بیرۆڤ؛ گەزەنە؛ خۆلیا؛ گزنەک؛ بیرۆی تەڕ؛ نەخۆشیەکی پێستە.

◘ **سودا پختن:** [مجازی] خەیاڵپلاو کردن؛ ئارەزووی بەتاڵ کردن.

**سودا کردن:** مامەڵە کردن؛ ئاڵ و وێر کردن؛ دانوستان کردن.

**سودای چیزی در سر داشتن:** هەوای شتێک لە سەردا بوون؛ لە بیر و بە شوێن شتێکدا بوون ‹سودای ریاست در سر داشت: خولیای سەرۆکی لە سەردا بوو›.

**سودائی** / sowdā'î, so:dā'î/: [عربی] ☜ **سودایی**

**سودازده** / sowdāzade, so:dā-، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] صفت. [ادبی] مەراق کردوو؛ ماخولیانی؛ ماخولە؛ هاژ و واژ.

**سوداگر** / sowdāgar, so:dā-، ـها؛ ـان/: اسم. [ادبی] بازرگان؛ مامڵەیەر؛ مامەڵەگەر؛ سەوداکار؛ کەسێ کە دانوسان دەکا.

**سوداگری** / sowdāgarî, so:dā-/: اسم. ١. بازرگانی؛ سەوداکاری؛ مامڵەگەری ٢. ☜ **مِرکانتلیسم**

**سوداوی** / sowdāvî, so:dāvî/: [عربی] صفت. سەودایی؛ سەوداوی: ١. ماخولیانی؛ خولیانی؛ ماخولیاوی ‹بیمار سوداوی: نەخۆشی ماخولیانی› ٢. مگێزی سەودایی؛ تووشی ئاوات و ئارەزووی دوور و درێژ و بنشڕ.

**سوداوی‌مزاج** / sowdāvîmezāc, so:dāvîmazāc، ـها/: [عربی] صفت. تاوتاوی؛ دەمدەمی؛ وازوازی؛ حولحولی؛ دەمدەمی مەزاج؛ عەنتەرمەزاج؛ هۆکی-هۆکی.

**سودایی** / sowdāyî, so:dāyî/: [عربی] صفت. [روان‌شناسی] ماخولیانی؛ خولیاوی؛ خەیاڵاوی؛ وازوازی؛ تووشیاری نەخۆشی ماخولیا: **سودائی**

**سودبخش** / sûdbaxš/: صفت. سوودمەند؛ قازانجدەر؛ بە کەڵک ‹نسخه‌ای که پزشک تجویز کرد سودبخش بود و بیمار شفا یافت: پسوولەیێ کە بژیشکەکە نواندی سوودمەند بوو و نەخۆشەکە چاک بووەوە›.

**سودجو** / sûdcû، ـها؛ ـیان/: صفت. قازانجەکی؛ سووپەرست؛ هەلپەرست؛ لە دووی قازانج و سووی خۆ بەبێ ڕەچاوکردنی سوود و زیانی خەڵک. هەروەها: **سودجوئی**

**سودگرایی** / sûdgerāyî/: اسم. قازانج خوازی؛ کەڵکوازی؛ ئامۆژەیەکی باو لە وڵاتانی ڕۆژئاوادا کە دەڵێ هەرچی قازانجی هەیە باشە و هەڵسوکەوتی دروست ئەوەیە کە قازانجێکی بە دواوە هەبێ: **اصالت فایده؛ اصالت نفع**

**سودمند** / sûdmand/: صفت. بەکەڵک؛ سوودمەند؛ سوودمەن؛ خێر؛ قازانجدار: ١. بە سوود؛ پڕخەیر ‹معامله‌ی سودمند: دان و سانی بەکەڵک› ٢. بەفایدە؛ فێدەمەند؛ بە شوێنەوا یان ئەنجامێکی دڵخواز ‹فعالیت سودمند: کار و چالاکی سوودمەند›.

**سودمندی** / sûdmandî/: اسم. خێر؛ دابەری؛ سوودمەندی؛ قازانجداری؛ قازانجدەری؛ دۆخ یان چوناوچۆنی بەقازانج بوون ‹سودمندی این برنامه در عمل معلوم می‌شود: خێری ئەم بەرنامەیە لە کاردا دەردەکەوێ›.

**سودن** / sûdan/: مصدر. [ادبی] ساوان؛ سوان؛ پیا ماڵین؛ پێدا هێنان؛ لێخستن؛ ڕێخستن؛ ساین؛ ساوین؛ ساوای؛ ساوەی؛ پیا ساوین؛ سوون. هەروەها: **سودنی**

■ صفت مفعولی: **سوده** (سواو)/ مصدر منفی: **نَسودن** (نەسوان)

**سور** / sor/ ☜ سرو خمره‌ای، **سرو**

**سور** / sûr/: اسم. سوور: ١. سوورانە؛ میوانی؛ خریفەک؛ بانگهێشتنی زۆرتر وێڕای خواردن و خواردنەوە ٢. شایانە؛ سووران؛ هانگ؛ داوەت؛

جێــژن؛ شــادمانی؛ گــۆوەن؛ گۆبــەن؛ گۆبەنــد؛ گۆڤــەند؛ شــایی؛ بــەزم ٣. هێــڵی لــە درێژایــی مۆغەرەی پشتی برێ چاروایان ٤. چاروایێ کـە هێڵی وای هەیە.

▣ **سور دادن**: سوورانە دان؛ شایانە نان؛ دیـلانی دان ‹حالا که کارت درست شده باید سور بدهی: ئێستە کە کارەکەت ڕێکی هاتووە، دەبێ سوورانە بدەی›.

**سوراخ** [1] / sûrāx ، ـها/:*اسم*. کـون؛ کونـا؛ کنـا؛ کوان؛ کوتە؛ سیلا؛ سیلاخ؛ قول؛ قولیلک؛ سۆنت؛ نقول؛ نوقول؛ ولـە؛ قلێـل: ١. هـلۆلی؛ شـەبەق؛ بۆشاییەکی خڕ و کەم تا زۆر قووڵ لـە ڕووبـەری شتێکدا ٢. کەلما؛ هێلانەیێ کە گیانـەوەران بـە هەلکۆلینی شوێنێ یان لە دەرەتـانێکی تەنگـدا بەدی دێنن ‹سوراخ مار؛ سوراخ موش: کونـی مـار؛ کونـە مـشک› ٣. هـەر یـەک لـە دەرەتانگـەلی ئەنـدامانی لـەش ‹سوراخ گوش: کونـی گـوێ› ٤. دڕاویــەکی گچکــە ‹سوراخ جوراب: کونـی گۆرەوێ› ٥. *[مجازی]* کوویژرک؛ کـاژێر؛ قـوژبن؛ قولینچک؛ سووچی تەنگەبەرە و بێفەڕ.

▣ **سوراخ بینی**: خـڕناش؛ بـڕناخ؛ قولـێ بێـڤل؛ فڕمک؛ ولـۆ لووتـێ؛ کونەکـەپۆ؛ کونـەتفنک؛ کونەلووت.

**سوراخ سوزن**: کونـە/ کونـای دەرزی؛ کنـای دەرزی: ١. سۆ؛ سۆما؛ ولۆچـەنێ؛ کوتەسـیزە؛ قولی دەرزی؛ کونی بن دەرزی کە بەنی لێـوە تێپەڕ دەکەن ٢. *[مجازی]* ولەچەن؛ کونـێ زۆر بچووک و ڕیز.

**سوراخ کلید**: کلر؛ کلـیر؛ کـونی دەرگـا؛ ولـۆ بەرەی؛ جێکلیل لە دەرکـەدا ‹از سوراخ کلید داخل اتاق را نگاه کردم: لـە کلرەکـەوە بـۆ نێـو ژوورەکەم ڕوانی›.

▣ **سوراخ دعا را گم کردن**: *[تعریض]* ڕاسـەڕێی ژێری ونکردن؛ کاری نابـەجێ کـردن ‹داداش تو سوراخ دعا را گم کردەای، عـوض اینکـه خانـه بخری، پولت را دادی به این ابوطیاره: بـرا ڕاسـەڕێی ژێریت ونکردووە، لـەبری ئـەوەی مـاڵ بکـڕی، پارەکەت داوەتە ئەم لۆقلۆقەیە›.

**سوراخ شدن**: کون بوون؛ کون تێبـوون؛ قـول بوون؛ کونا بوون؛ قۆقلین؛ ولە بیەنەی/ بیەینە ‹زانوی شلوارم سوراخ شد: سـەر ئـەژنۆی شوالـەم کون بوو›. هەروەها: **سوراخ بودن؛ سوراخ کردن**

**سوراخ** [2]: *صفت*. کون؛ کونا ‹جیب سوراخ: گیرفـانی کون›.

**ســوراخســنبه** / sûrāxsombe, -sonbe/ ☜ **سوراخوسنبه**

**سوراخوسنبه** / sûrāx-o-sombe, -sonbe ، ـها/: *اسم*. کونوقوژبن؛ کـونوبـون؛ کوناوبنـا؛ کـون و کاژێر؛ کەلێن و کولێن؛ کون و کەلەبەر؛ جێگای پێچ و بەرچاونەگر بـۆ شـت شـاردنەوە ‹همەی سوراخ و سنبەها را گشتند و چیزی نیافتند: هەموو کـون و قوژبنێکیـان پـشکنی و شـتێکیان نەدۆزیـەوە›: **سوراخسنبه**

**سورپریز** / sûrprîz/: [فرانسوی]*اسم*. سـوورپریز؛ کـاری چـاوەڕوانـنـەکراو کـە دەبێتـە هـۆی خۆشحاڵی کەسانیتر.

**سورتر** / sorter/: [فرانسوی] ☜ **سُرتر**

**ســورتمه** / sûrtme ، ـهـا/: [ترکـی]*اسم*. کاشـە؛ خزاگ؛ تـاخورک؛ پێگـۆزی بـێچـەرخ کـە لـە شـوێنی بەستەڵـەک و بـەفردا بـە خلیـسکان دەکێشرێ.

**ســورچران** / sûrčarān/: *صفت*. *[مجازی]* ورگلەوەڕێن؛ مووسەل؛ چەورە؛ چـڵێس؛ زکـن؛ لـەگام؛ وەردەک؛ لـەم لەوەڕنـە؛ سـکچـەرێن؛ هۆکارە بە زگ بەردانەوە.

**ســورچرانی** / sûrčarānî ، ـهـا/: *اسم*. ورگلـەوەڕێنی؛ سـکچـەرێنی؛ مالانگـەڕی بـۆ خواردن و زگ بەردانەوە.

**سورچی** / sûrčî ، ـها؛ ـان/: [ترکی]*اسم*. ئـاژۆر؛ ئاژوان؛ لێخوڕ؛ ڕانبار؛ ڕاننده (بەتایبەت ئی گاری و

دروشکه›.

**سوورڕئالیــست** / sûr.re'ālîst ، ـهـا/: [فرانسوی] *صفت.* سوورڕئالیست: ١. پەیڕەو یـان لایـەنگری سوورڕئالیسم ٢. ☜ **سووڕئالیستی**

**سوورڕئالیستی** / sûr.re'ālîstî/: [فرانسوی] *صفت.* سووڕئالیستی؛ سـەر بـە سوورڕئالیسم: **سوورئالیست ـ٢**

**سوورڕئالیسم** / sûr.re'ālîsm/: [فرانسوی]/*اسم.* سووڕئالیسم؛ بزووتنەوەیەکی ویژەیی و هونـەری کە بـڕوای بـە وێنـاکردنی ئازادانـە و ڕاشـکاوی زەین و هزرە، بێ ئەوەی ئاوەز، ژیری یان داب و نەریت دەستیان تێوەردا و بیانگۆڕێ.

**سورسـات** / sûrsāt/: [ترکـی]/*اسم.* *[گفتـاری]* سوورسات؛ تۆشە و تفاقی پێویست ‹فـردا مهمـان داریم و باید از امروز سورسات مهمـانی را فـراهم کنیم: سبەینێ میوانمان هەیە و هـەر لـە ئەمـڕۆوە دەبێ سوورساتـی میوان دابین کەم›: **سیورسات؛ سـور و سات**

**سورشـارژ** / sûršārj ، ـهـا/: [فرانسوی]/*اسم.* سوورشارژ؛ پارەیەکی زێـدە و زۆرتـر لـە نرخـی ئاسـایی بـۆ جـۆرە ڕاژەیـێ کـە بـە گـۆڕانی هەل‌ومەرج وەردەگیردرێ ‹کشتیها برای هر هفتـه تأخیر در تخلیه‌ی بارشان، سورشارژ می‌گیرند: گەمیەکان بۆ هەر حەوتەیەک دواکەوتنی داگرتنی بارەکانیـان، سوورشارژ دەستێنن›.

**سورمه‌ای** / sorme'î/ ☜ **سُرمه‌ای**

**سورنا** / surnā/ ☜ **سُرنا**

**سورنجان** / sûrancān ، ـها/: *اسم.* گوڵـەگـەزیزە؛ گوڵــەئاوەنیــا؛ گوڵــەجووتیار؛ گوڵــەجووتێرە؛ گوڵــەعەزرەتی؛ گوڵــەخەیارک؛ گوڵــەپاییزە؛ جووتیــارۆک؛ بەنگلــەژیلــە؛ بکـێڵ‌ومــەکێڵ؛ بکێـڵێەی‌پـاییز؛ پیـازی هـوورچ؛ سـوورنجان؛ سووریجان؛ زەعفەرانی مێرگ؛ گیایەکی ئـالیکی گوشتن و سەلک‌دارە بە گەڵای درێژ و باریـک و نووک‌تیژ و بێ‌کوڵکەوە، بە ڕەنگی سەوزی تـۆخ، گوڵی بنەوش و بەری کەپسوولی دەنک زۆر، کە گوڵ و سەلک و دانەکەی بۆ دەرمان دەبن.

**سور و سات** / sûr-o-sāt/: [ترکی] ☜ **سورسات**

**سوره** / sûre ، ـها/: [عربی]/*اسم.* سوور؛ سـوورەت؛ هەر یەک لە پاژگەلی جیاوازی قورعـان کـە بـۆ خۆی دەبێتە چەند ئایەت.

**سـوری**[1] / sûrî ، ـهـا/: [عربـی]/*اسم.* سـووری؛ سووریەیی؛ سـوورییایی؛ هـەر کـام لـە خەڵـکی وڵاتی سووریە.

**سوری**[2]: *صفت.* ١. بـەزمی؛ گۆڤـەندی؛ دیـلانی؛ ئۆگری مێوانی و ڕابواردن ٢. [عربی] سـوریەیی؛ سوورییایی؛ سـووری؛ پێوەندیـدار یـان سـەر بـە وڵاتی سووریە.

**سوز**[1] / sûz/: *اسم.* سۆز؛ کزە؛ سۆژ؛ سۆزە؛ سـزە: ١. *[مجازی]* ئەوەی دەبێتـە هـۆی ئـازاری لـەش یان ڕەوان ‹سـوز سـرما؛ سـوز غـم: کـزەی سـەرما؛ سۆزی خەم› ٢. *[مجازی]* کەزلاتەی دەروون ‹سوز جان: کزەی گیان› ٣. سەقەم؛ سۆڵە؛ کزەبا؛ سـر؛ سوو؛ تۆژن؛ بای وێڕای ساردی.

⊡ سوز آمدن: سۆزکردن؛ کزە هەڵـکردن؛ کـزە هـاتن؛ کـزە هۆرکـەردەی؛ سۆڵـەبا/ کـزەوا هەڵکردن.

**ـ سوز**[2]: *پیواژه.* ـ سووتێن؛ ـ شۆز؛ ـ سۆز؛ ـ سۆژ: ١. ـــ کـزێن؛ هـۆی ئـازار و سـووتان ‹جانسـوز: گیانسووتێن› ٢. ـ سۆچن؛ سـووتێنەری شـتێک ‹نفت‌سوز: نەوت‌سۆز›.

**سـوزآور** / sûzāvar/: *صـفت.* سـووتێنەر؛ بـە تایبەتمەنـدی و قـەوەتی سـووتاندنەوە ‹سـود سوزآور: سوودی سووتێنەر›.

**سوزاک** / sûzāk/: *اسم.* سۆزەنەک؛ سوسەنەک؛ نەخۆشیەکی چلکی جنسی گـیرۆدارە کـە بـە ئاییسان و سووتانەوەی میزەڕۆوە دەناسرێ.

**سوزان**[1] / sûzān/: *صفت.* بەتین؛ بەتین‌وتـاو؛ زۆر گەرم ‹عشق سوزان: ئەوینی بەتین›.

**ـــ سـوزان**[2]: *پیـواژه.* ـــ سـووتان ‹کتابسوزان:

کتێب‌سووتان›.

**ســــوزاندن** / sûzāndan/: مـــصدر. متعـــدی. // **سوزاندی**: سووتاندت؛ **می ســوزانی**: دەسووتێنی؛ **بِســوزان**: بسووتێنە// ســووزاندن؛ ســووتاندن؛ ســووزانن؛ شــەوتاندن؛ شــوتاندن؛ داچزانــدن؛ ســووتانن؛ ســـچاندن؛ ســـچانن؛ ســـۆزاندن: ١. ئاگردان؛ گڕ تێ‌بەردان؛ سۆژاندن؛ سۆژتاندن؛ سوژاندن؛ سۆچنەی؛ سۆچنای؛ گڕنەی؛ گـڕنای؛ ئـــەیر دەی؛ ئـــایر دای؛ بـــۆ ســـووتەمەنی و بەرهەمهێنانی گەرما، کەڵک لە شتێ وەرگـرتن ‹روزی ٢٠ لیتر نفت مـی‌سـوزاند: بـە ڕۆژێـک ٢٠ لیتـر نـەوت دەسـووتێنی› ٢. هەڵـکردن؛ داگرسـاندن؛ ئایساندن؛ ئەنەگیسنەی؛ گیسنایَنە؛ ڕۆشن‌کردن؛ بـۆ بەرهـەمهێنانی ڕوونـاکی کەڵـک لـە شـتێ وەرگرتن ٣. بە هۆی ئـاگر یـان گـەرماوە، تێـدا بـردن ‹سـوزاندن زبالـە: سووتاندنـــی زبـڵ‌وزاڵ› ٤. *[مجازی]* ئاوردان؛ ئاگر تێ‌بەردان؛ بەهەجاندن؛ ئاراندن؛ زۆر تـووڕەکردن ٥. *[مجـازی]* ئێـشاندن؛ تەزاندن؛ ئازراندن یان خەمی یـەکجاری پێـدان ٦. *[پزشکی]* لابردنی بالووک و خاڵ بە لەیزر یـان کارەبا یان ماکی کیمیاوی ٧. تووزاندن؛ بـە داغ یان گەرمی، ئازارگەیاندن ‹فلفل دهـانم را سـوزاند: ئالـەتەکە دەمـی سـووتاندم› ٨. ســووتاندنەوە؛ سۆلاندنەوە؛ ئەوەسۆڵنەی؛ سۆڵنایوە؛ کزاندنـەوە؛ چووزاندنەوە؛ تووزاندنەوە؛ ئەوەکزنەی؛ کزنـایوە؛ کووزاندنەوە؛ تووشیاری سۆزشت یان ژان‌کـردن

* **سوزانیدن**. هەروەها: **سوزاندنی**

■ صـفت فـاعلی: **ســوزاننده** (ســووتێنەر)/ صـفت مفعـولی: **ســــوزانده** (ســووتێنراو)/ مـصدر منفـی: **نَسوزاندن** (نەسووتاندن)

**سوزانیدن** / sûzānîdan/ ☜ **سوزاندن**

**سوزش** / sûzeš ، ـها/: اسم. کـزە؛ کـووز؛ چـووز: ١. کاوە؛ کـار یـان ڕەوتی سـووتانەوە، برژانـەوە، تووزانەوە، چووزانـەوە، چووزینـەوە، سـووزانەوە، کاویانـەوە، کزانـەوە، ئـەوە کزیـەی، کزیـایوە؛ هەستی ژانی پێست بە هۆی لێکـەوتنی داخـی ٢. کزانەوە؛ چووزانەوە؛ خورانـەوە؛ هەسـتی ژان بـە هـۆی تێـڕۆچوونی شـتێ (وەک چـز، دڕک، فیشەک و...) لە پێستدا ٣. هـەر شـتێکی لـەو چەشنە ‹سوزش غم: کزەی خەم›.

**ســوزمانی** / sûzmānî/: صفت. *[گفتاری]* پـەتیار؛ سووزانی؛ لەوەن؛ سووزمانی؛ جلَف؛ سووکە سەر (بۆ کچ و ژن).

**ســوزن** / sûzan ، ـهـا/: اسم. دەرزی؛ دەرزە؛ دەرزن؛ دەرژەن؛ سیزە؛ سیزی؛ سووزن؛ شویژن؛ چـەنی: ١. ئـامێری درووومـان بـە شـێوەی میلەیەکی پۆلایی و چکۆلە و باریکی نـووک‌تیـژ بە کونێکی ڕیز لـەوبنیـەوە بـۆ تێخـستنی بـەن ٢. *[قـدیمی]* شـرینقە؛ سـورەنگ ٣. *[قـدیمی]* ئەمپوول ٤. میلەی نووک تیـژی مقەنەزمـە کـە دەبێتە هۆی تەقینەوەی گـوللە ٥. *[گیاەشناسی]* دڕک؛ دڕوو؛ چقـڵ؛ چـەقڵ ٦. *[مجـازی]* هـەر شـتێکی وەک دەرزی ‹سـوزن گرامـافون: دەرزی گرامافون› ٧. سۆژن؛ سووژن؛ کەرەستەیەک بـە شێوەی دوو ڕەیلی بزۆک، بەلکامێرەکانیەوە، بـۆ گۆڕانی هێڵی قەتار یان لکومۆتیو.

▣ **سوزن تە گرد** ☜ **سنجاق تەگرد**

▣ **سوزن بە تخم چشم خـود زدن**: *[مجازی]* خـۆ کوێرکردن؛ دووڕین و خەیاتی زۆرکردن ‹برای یک لقمە نان سوزن بە تخم چشمم می‌زنم: بۆ پاروووە نانێک خەریکم خوم کویر دەکەم›.

**سوزن زدن**: ١. دەرزی پێوەکردن؛ پینەوپـەڕۆ کردن؛ تەقەڵ لێـدان؛ دروومـان‌کـردن ‹برای گذران زندگی بچەها از صبح تا شب سوزن می‌زند: بۆ بەڕێوەچوونی ژیانی منداڵـەکان لـە بەیانیـەوە تـا ئێـواریٚ هـەر دەرزی پێـوە دەکـا› ٢. دەرزی لێدان؛ دەرزی وەشاندن؛ چەن شـەی/ شـای؛ ئـامپۆل لێـدان ٣. *[گفتـاری]* دوو تـاڵ دەزوو پێـــوەکردن؛ دووران؛ دروان؛ دوورینـــەوە؛ ئەوەوراسەی؛ چەن وەنە دای ‹این دگمـە شـل

شده، بگیر دو تا سوزن بهش بزن!: ئەم دوگمـە شـل بۆتەوە، هانێ دوو تالە دەزووی پێوە کە!›.

**سـوزن ـــ سـوزن شـدن:** *[مجـازی]* تـەزین؛ دەرزیئاژن بوون؛ چەنئـاژین بیـەی ‹پاهـایم سوزن‌ـسوزن می‌شد: پێم دەتەزین›.

**سوزن شدن و به زمین فرو رفتن:** *[مجازی]* بوون بە تکێ ئاو و چوون بە زەویا؛ زەوی قووت دان یا ئاسمان هەڵلوشین؛ بە نان هـاتن و بـە ئـاو قووت دریان؛ بە تاڵی موو بوون و لە ئاسمان و زەویدا نەمان؛ نوقم بوون؛ مەحفەو بوون.

**سوزن نخ کردن:** دەرزی پێوەکردن؛ دەزوو بە دەرزیەوەکردن؛ مەچیرکردنە کونای دەرزیدا؛ چەن کەردە پۆنەی ‹چشمم خوب نمی‌بیند، بگیـر این سوزن را نخ کن!: چاوم کز بوون، ها ئەم دەرزیە پێوەکە!›.

**سوزناک** / sûznāk/: *صفت.* بەسـۆز؛ سـۆزناک؛ سۆزاوی؛ خەماوی یان خەمهێنـەر ‹آواز سـوزناک: هەوای بەسۆز›.

**سـوزنبان** / sûzambān, sûzanbān ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سووژنوان؛ سۆژنوان؛ مەقەسچی؛ کارگێـڕی ڕێئاسن کە لە شوێنی لق لێوە بوونی هێـڵەکاندا بە بەستنی هێڵی لاتـەکی، قـەتار بـەرەو هێـڵی سـەرەکی خـۆی ڕێنـوێنی دەکـا. هــەروەها: **سوزنبانی**

**سوزن‌دان** / sûzandān ، ـها/: *اسم.* دەرزیـدان؛ دەرزندان؛ دەرزیدانک؛ کۆرەدەرزی؛ سـووزندان؛ چەندان؛ کیسە یان قوتوولەیەک بۆ جێ دەرزی.

**سوزنکاری** / sûzankārî ، ـها/: *اسم.* دەرزیکـاری؛ نەقش و نیگاری بە سەر پارچەدا دووراو.

**سوزنکش** / sûzankeš/ ☜ **سنجاق‌کش**

**سوزن‌ماهی** / sûzanmāhî ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ماسیە دەرزیلە؛ دەرزی ماسـی؛ ماسـیەکی پێـشەداری لەش‌ناسک و درێژە بە قاپێلکی ڕەقەوە.

**سوزن‌نخ‌کن** / sûzan.naxkon ، ـها/: *اسم.* بـەن تێخەرە؛ بەن پێوەکەر؛ کەرەسەیێ بۆ بەن کردنە دەرزیەوە.

**سوزنی**[1] / sûzanî ، ـها/: *اسم. [قدیمی]* دۆشەکچە؛ تیکە پارچەیەکی لە جنسی ترمە، مەخمەڵ یان کەتان بە نەخشی ڕازاوەی دووراوە کـە پتـر لـە جـل کەنـدنی حەمامـدا بـۆ لـە سەردانیـشتن دایاندەنا.

**سوزنی**[2]: *صفت.* ١. دەرزیلـەیی؛ دەرزینـە؛ وەک دەرزی؛ نـــکتیـــژی ‹برگهــای ســوزنی: گــەڵا دەرزیلەییـەکان› ٢. سـووژنی؛ دەرژەنی؛ سـەربە دەرزی یا پێوەندیدار بە دەرزیەوە ‹طـب سـوزنی: بژیشکی سووژنی›.

**سـوزنی‌بـرگ** / sûzanîbarg ، ـها؛ ـان/: *اسم.* گەڵادەرزیلە؛ گەڵادەرزیلەیی؛ گیا بە تایبەت دار و دەوەنی لێڕەواری کە گەڵاکانی درێژ و باریـک هەر وەک دەرزی یا وەک پووڵەکەیە و زۆرتر لە ناوچەگەلی ساردەسێردا دەبینـرێ (وەک کـاج، سەوڵ و...).

**ســـوزوگداز** / sûz-o-godāz/: *اســم. [ادبــی]* کــوڵوکەســەر؛ دەرد و مەینــەت؛ دەرد و ئـازار؛ خەم و جەخار؛ خەم و خەفەت؛ مەراق ‹این همـه سوز و گداز از پی چیست؟: هۆی چیە ئەم هەموو کـوڵ و کەسەرە؟›.

**سـوزیخانه** / sûzîxāne ، ـها/: *اسم.* سـووتێنگا؛ بینایـەک جـار و بـارە لـە پـەنا پەرسـگەوە (لـە هەنـدێک وڵاتـان)، کـە لاشـەی مـردوانی تێـدا دەسووتێنن و دەیکەنە بووڵ.

**سوژه** / sûje ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* مژاد؛ درگـە؛ درخە؛ بابەت؛ کرۆک؛ هەیبەر؛ کاربەند ‹کارهایش شـدە بـود سـوژەی جـوک: کارەکـانی ببـووە مـژادی تیتاڵی›.

▣ **سوژەی داغ:** *[مجازی]* قاڵە بـاس؛ قـاڵ ‹بـرای مقالات یک سوژەی داغ پیدا کردەام: بـۆ وتارەکـەت قالە باسێکم دۆزیوەتەوە›.

**سوس** / sûs/ ☜ **شیرین‌بیان**

**سوسپانـسیون** / sûspānsiyon/: [فرانسوی] *اسم.*

*[شیمی]* سووسپانسیۆن: ١. دۆخی تەنێک، کاتی گەردیلەکانی لەگەڵ تراو یان نەگۆڕێکدا تێکەڵ ببێ بەڵام تێیدا نەتوێتەوە ٢. تەنێک بەتایبەت تراوێ کە ئەم دۆخەی هەبێ.

**سوسری** / sûsarî ، ـها/: *اسم.* سیسرگەچەپەڵە؛ خزۆک؛ قالۆچەی حەمام.

**سوسک** / sûsk, susg/: *اسم.* قالۆچە؛ قالۆنچە؛ قولاچە؛ قۆلانچە؛ قولانجە؛ قالونچک؛ قۆلانچێ؛ قالورە؛ قۆلە؛ خروک؛ خازباز؛ خازیبار؛ کێز؛ کێزک؛ قالۆچەی کەسک؛ ناوی گشتی مێروانی باڵقاپ بە چوار باڵەوە کە دووی سەروویان ڕەق بووە و دووی ناوەوە دەپارێزێ.

▣ **سوسک حمام:** سیسرگە چەپەڵە؛ خزۆک؛ قالۆچەی حەمام.

**سوسک طلایی:** قالۆنچە زەردە؛ مێروویەکی زل و هێواش ڕەوتە، بە ڕەنگی زێڕی ئامال سوور کە هێرش دەباتە سەر کشت و کالی چۆنەر و چۆنەرقەن، مێوینەکەی لە بن زگەوە شاخۆکەیێ تیژی هەیە زەوی پێ هەڵدەکۆلێ.

**سوسمار** / sûsmār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* مارتوولە؛ مارمێلکە؛ مارمالووک؛ مارمزووک؛ مارمەزووک؛ مارگیسک؛ مارگیس؛ سووسەمار؛ مالمالک؛ قۆریانە؛ مالمالۆک؛ مارشێوک؛ بلقەدەر؛ شەوگەرد؛ خلنەزەر.

▣ **سوسمار شاخدار:** مارمێلکەی شاخدار؛ جۆرێ مارمێلکی دنیای تازە (ئەمریکا و ئوسترالیا) بە لەشی پان و تەخت و دڕکن و دووشاخی گەورە بە سەریەوە.

**سوسمارماهی** / sûsmārmāhî ، ـها؛ ـان/: *اسم.* مارمێلکە ماسی؛ جۆرێ ماسی تایبەتی زەریای ناوچەی ئوستوا.

**سوسن** / sûsan ، ـها/: *اسم.* سوێسنە؛ سووسن؛ سۆسن؛ سوێسن؛ گوڵەسۆسەنێ؛ سێسنە؛ سیسەن؛ کاری؛ پەلێزە؛ گیای سەلکداری هەمیشەیی، بە گەڵای درێژ و باریک و گوڵی هێشووی هەمەڕەنگەی گەورە و بۆنخۆشەوە.

**سوسنبر** / sûsambar, sûsanbar ، ـها/: *اسم.* سووسەمبەر؛ سووسەنبەر؛ سیسەنبەر؛ جاترەمە؛ جاترەکێویلە؛ هەزبیلەکێویلە؛ چەشنێک جاترەی بۆنخۆش بە گوڵی سپی مەیلەو ئاڵ و گەڵای پان و ددانەدارەوە کە بۆ مەبەستی بژیشکی و بەهارات و عەترسازی بەکاردێت.

**سوسن‌عنبر** / sûsan'ambar, -'anbar/: [فارسی/ عربی] ☜ **سوسَنبَر**

**سوسنی**[1] / sûsanî/: *اسم.* سوێسنەڕەنگ؛ سووسنی؛ ڕەنگی ئاڵ بە تامێکی بنەوشەوە.

**سوسنی**[2]: *صفت.* سووسنی؛ بە ڕەنگی ئاڵی نەختێک بنەوش.

**سو- سو** / sûsû/: *اسم.* سووسە؛ ویسکە؛ زریوە؛ تررووکەترووک؛ سووسە سووس؛ وڕشەوڕش؛ ویس‌ـویس؛ ویسەویس؛ زریوەزریو؛ نووتە؛ دۆخی تیشکی کز و بێ‌گیان، کە لە پەستا وەک هەڵبێ و داییسێ دێتە بەرچاو. هەروەها: **سو ـ سو زدن**

**سوسول** / sûsûl ، ـها/: *صفت.* *[مجازی]* قرت و فرت؛ قرت؛ قرتی؛ جلف؛ سووسوول ‹یک جوانک سوسول هم آمد، نشست بغل دستش: لاوێکی قرت و فرتیش هات و لە پەنایدا دانیشت›.

**سوسه** / sûse ، ـها/: *اسم.* *[گفتاری]* ١. فێڵ؛ گز؛ گزە؛ گزی؛ تەڵەکە؛ فڕ و فێڵ ‹باور کن هیچ سوسه‌ای در کار نیست: بڕوا کە هیچ فێڵێ نەکراوە› ٢. پیلان؛ داو؛ تەڵە.

▣ **سوسه آمدن:** داو نانەوە؛ پیلان بۆ داڕشتن ‹در اداره برایش سوسه آمدند و موجب اخراجش شدند: لە مەزرینگەدا داوایان بۆ نایەوە و بوونە هۆی دەرکرانی›.

**سوسه دواندن در کار کسی:** *[مجازی]* چوکڵەشکێنی‌کردن لە کاری کەسێکدا؛ لە کاری کەسێکدا کارشکێنی‌کردن؛ دژ بە

کەسێ بانگەشە کردن.

**سوســـیال‌دمکـــرات** / sos(i)yāldemokrāt/: [فرانسوی] *صفت. [سیاست]* سووسیال دیموکرات: ١. سەر بە سووسیال‌دیموکراسی ٢. لایەنگر و شوێنەڕۆی سووسیال‌دیموکراسی.

**سوســیال‌دمکراســی** / sos(i)yāldemokrāsî/: [فرانسوی] *اسم. [سیاست]* سووسیال دیموکراسی؛ بزووتنەوەی ئاپۆرەیی لایەنگری گوێزرانەوەی کۆمەڵگا لە سەرمایەدارییەوە بۆ سووسیالیستی بە شێوەگەلی ئاشتیخوازانە و دیموکراتیک.

**سوسیالیــست** / sos(i)yālîst، ـهـا/: [فرانسوی] *صفت. [سیاست]* سووسیالیست؛ لایەنگر و شوێنداچووی سووسیالیسم.

**سوسیالیستی** / sos(i)yālîstî/: [فرانسوی] *صفت.* سووسیالیستی؛ پێوەندیدار یان هاوگەری سووسیالیسم.

**سوسیالیــسم** / sos(i)yālîsm/: [فرانسوی] *اسم. [سیاست]* سووسیالیسم: ١. ئامۆژەیەکی فەلسەفی کە بڕوای بە لا چوونی خاوەنداریەتی کەس بە سەر ئامێری بەرهەم هێنان و سەرمایەدایە ٢. سیستەمێکی سیاسی کە بە پێودانی ئەم ئامۆژەیە پێکهاتووە.

▣ **سوسیالیسم ملی** ☜ **نازیسم**

**سوسیس** / sosîs، ـهـا/: [فرانسوی] *اسم.* زونگ؛ پاسترمە؛ باسترمە؛ گۆشت و سۆیای قیمەکراوی بارهاتووی لوولەکراو.

**سوش** / sûš، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ١. بنچەک؛ تاچەک ٢. *[قدیمی]* بنج؛ بناوان؛ ڕەگ و ڕیشە.

**سـوغات** / sowqāt, so:qāt، ـها/: [ترکی] *اسم. [گفتاری]* دەسەدیاری؛ دیاری؛ دەسایز؛ دیهاری؛ سۆقات؛ سەوقات؛ دەستەریقانە: **سوقات**

**سوغاتی** / sowqātî, so:qātî، ـها/: [ترکی] *اسم. [گفتاری]* دیاری؛ دەسەدیاری؛ دەسایزی؛ سۆقاتی؛ ئەوی بە دیاری دەیهێنن: **سوقاتی**

**سوفار** / sûfār/: *اسم.* ١. ڕاد؛ پەڕی تیری کەوان؛ چوکلەی لای خوارووی تیر ٢. سۆما؛ سۆ؛ سۆنت (بەتایبەت ئی دەرزی).

**سوفـسطائی** / sûfestā'î, sûfastā'î/: [معرب از یونانی] ☜ **سوفسطایی**

**سوفسطایی** / sûfestāyî, sûfastāyî، ـان/: [معرب از یونانی] *صفت.* سووفەستایی؛ لایەنگری ڕێبازی فەلسەفی یۆنانی کەونارا کە بە هۆی بەڵگەهێنانەوەی زیرەکانە و قسەوباسی بە ڕواڵەت دروست، ناوبانگی هەبوو: **سوفسطائی**

**سوفلور** / sûflor، ـها؛ ـان/: [فرانسوی] *اسم. [تئاتر]* سووفلور؛ چپەدوو؛ کەسێ کە لە ژێر شانۆدا دادەنیشێ و قسەکانی شانۆیاران، لە ڕووی شانۆنامەوە، بە گوێیاندا دەداتەوە.

**ســوف‌مـاهی** / sûfmāhî، ـهـا؛ ـان/: *اسم.* تەشیماسی؛ ماسیپانک؛ ماسیەکی دڕکن، بە لەشی وەک تەشی، دەمی زل، شەویلاکی زۆپ و دوو باڵەی سەر پشتی جیا لە یەکەوە: **ماهی سوف؛ ماهی خاردار زرد؛ پِرش؛ فَرخ**

**سوق** / sowq, so:q/: [عربی] *اسم. [ادبی]* هان؛ دنە؛ بۆق؛ کاری هەڵنان و بەرەو لایەک بردن ‹برادرش را در جهت پیشرفت سوق می‌داد: براکەی بەرەو پێشکەوتن هان دەدا›.

**سوقات** / sowqāt, so:qāt/: [ترکی] ☜ **سُوغات**

**ســوقاتی** / sowqātî, so:qātî/: [ترکی] ☜ **سُوغاتی**

**سوق‌الجیـشی** / sowqolceyšî, so:q-/: [عربی] *صفت.* ستراتیژیکی؛ سەر بە ستراتیژی.

**ســوک** / sûk/: *اسم.* ١. لا؛ ئالی؛ نک؛ لایەن ٢. *[گفتاری]* سووچ؛ سیلە؛ گۆشە؛ موور.

**سوکــسه** / sûkse/: [فرانسوی] *اسم. [گفتاری]* هۆگری؛ وە بەردڵ کەوتووی ‹این رنگ تازگیها سوکسه پیدا کرده: ئەم ڕەنگە ماوەیەکە هۆگری پەیدا کردووە›.

**ســوگ** / sûg/: *اسم. [ادبی]* سوێ؛ سو؛ سۆ؛ ئازیەت؛ تازیە؛ ماتەم؛ ئازیەتی؛ شین؛ پرسە؛

چەمەری؛ بنهاری؛ گریان و شین و ماتەم لەبەر لەدەستدانی کەسێ یا شتێکی هێژا.

◘ به سوگ نشاندن: ۱. داخدارکردن؛ ئازیەتبار/ تازیەبارکردن ‹مرگ او همه را به سوگ نشاند: مەرگی ئەو هەمووی تازیەتبارکرد› ۲. *[کنایی]* نیانه قوڕ؛ ئازار پێگەیاندن.

به سوگ نشستن: ۱. ئازیەتبار/ تازیەبار بوون ۲. ئازیەتیگرتن/ دانان.

**سوگلی** / sowgolî, so:golî ، ـها/: [ترکی] *صفت.* *[گفتاری]* نازار؛ نازدار؛ نازینار؛ نازیله؛ نازی؛ خۆشەویستی تایبەتی ‹آرام، فرزند سوگلی خانواده بود: ئارام، مندالی نازاری ماڵ بوو›.

**سوگنامه** / sûgnāme ، ـها/: *اسم. [ادبی]* شینٮامه؛ دەقێ کە سەبارەت بە ماتەم و تازیە نووسراوە: **تعزیت‌نامه**

**سوگند** / sowgand, so:gand ، ـها/: *اسم.* سوێند؛ سوێنگ؛ سوێن؛ سۆند؛ سووند؛ سۆکەند؛ سوێند؛ قەستەم؛ قەسەم: ۱. کار و ڕەوتی سوێند خواردن ۲. وشە یان ڕیزوشەیەک بۆ ئەو مەبەستە.

◘ سوگند خوردن: سوێند خواردن: ۱. سوێند بەرز دان؛ گەواگرتنی کەس یان شتێکی پیرۆز بۆ دروستی وتەی خۆ ‹به خون شهیدان سوگند می‌خوریم که از پای ننشینیم: بە خوێنی شەهیدان سوێند دەخۆین هەدا نەدەین›: **سوگند یاد کردن** ۲. مەرجکردن لە سەر ڕووداوێکی نالەبار بۆ پێداگری و بە دروست زانینی قسەی خۆ (وەک «خودا ئەمن بکوژێ ئەر درۆم گوتبێ») ✱ **قسم خوردن**

**سوگند دادن**: سوێند دان؛ سوێند پێدان؛ قەسەم دان ‹او را سوگند داد که راستش را بگوید: سوێندی دا ڕاستەکەی بێژێ›.

**سوگند شکستن**: سوێند شکاندن؛ پێنانە سوێندا؛ بەڵێنێ کە سوێندی لەسەرە، بەجێ نەهێنان.

سوگند یاد کردن ☜ **سوگند خوردن ـ۱**

**سوگندنامه** / sowgandnāme, so:gand- ، ـها/: *اسم.* سوێندنامە؛ سۆندنامە؛ دەقێکی فەرمی و دەپێش ئامادەکراو لە سۆندان بۆ سوێند خواردن و سوێند دان ‹سوگندنامه‌ی پزشکان: سوێندنامەی بژیشکان›.

**سوگوار** / sûgvār ، ـان/: *صفت.* ئازیەتبار؛ تازیەبار؛ عازیەتدار؛ ماتەمبار؛ تووشی پەژارەی ئاستەم بە بۆنەی لەدەستدانی کەسێ یا شتێکی هێژا ‹این مصیبت را به خانواده‌های سوگوار تسلیت می‌گوییم: ئەم کارەساتە لە بنەماڵەگەلی تازیەتبار سەرەخۆشی دەکەین›.

**سوگواری** / sûgvārî ، ـها/: *اسم.* ئازیەتباری؛ ئازیەتی؛ شینگێڕی: ۱. باری ئازیەتبار بوون ‹ایام سوگواری: ڕۆژانی ئازیەتباری› ۲. ئەو کارانەی کە لە خەمی نەمانی کەسێکی خۆشەویستدا دەکرێن ‹مراسم سوگواری: داب و دەستووری ئازیەتی›.

**سولفات** / sûlfāt ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* سوولفات؛ خوێی ترشی سوولفوریک.

**سولفژو** / sofej/ ☜ **سُلو**

**سولنجان** / sûlancān/ ☜ **سورنجان**

**سولنویید** / solenoîd/: [فرانسوی] ☜ **سُلِنُوئید**

**سولو** / solo/: [ایتالیایی] ☜ **سُلو**

**سوله** / sole ، ـها/: [؟] *اسم.* سوولە؛ جۆرێ پۆشەنی لالێژی میچ کە زۆرتر بۆ هەمار و کاری پیشەسازی چێدەکرێ.

**سولیست** / solîst/: [فرانسوی] ☜ **سُلیست**

**سوم**[1] / sevvom/: *اسم.* سێ ڕۆژە: ۱. هیرینە؛ هیرین؛ سێهەمین ڕۆژی مردنی کەسێک ‹امروز سوم پدر آرام است: ئەمرۆ سێ‌ڕۆژەی بابی ئارامە› ۲. سێڕۆژانە؛ ڕێوڕەسمی ڕۆژی سێهەمی مردن.

**سوم**[2]: *صفت.* سێهەم؛ سێیەم؛ سێمینە؛ یەرەم؛ یەرۆم؛ هیرن؛ هیرین؛ هیرینە؛ بە ڕیز، ڕزن، پایە

یان جێگەی سێوە.

**سومری** / sûmerî/: *اسم.* سوومری: ١. ـهـا؛ ـان/ هەر یەکە لە خەڵکی وڵاتی کەونارای سووومر لە باشووری عیراقی ئێستادا ٢. زوانی ئەو خەڵکە کە پێوەندی لەگەڵ گرۆ زوانەکانی تردا نەناسراوە.

**سومشخص** / sevvomšaxs ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* [دستور] سێهەمکەس؛ یەرەم کەس؛ ئەوەی لە بارەیەوە قسە دەکرێ ‹«او» و «آن»، ضمیر سوم شخص مفرد است، «ایشان»، «آنها» و «آنان» ضمیر سوم‌شخص جمع: «ئەو» و «ئەوە» جێناوی سێهەم‌کەسی تاکە و «ئەوان» و «ئەوانە» جێناوی سێهەم‌کەسی کۆ›.

**سومی** / sevvomî ، ـها/: ضمیر. سێهەمی؛ سێومی؛ یەرەمی؛ ئەوەی لە ڕیز، پلە یان جێگەی سێهەمدایە.

**سومین** / sevvomîn/: *صفت.* هیرین؛ سێهەمین؛ هیرییەن؛ یەرەمین؛ بە پلە، ڕیز یان جێگەی سێهەمەوە.

**سونا** / sonā/: [فرانسوی از فنلاندی] ☜ حمام سونا، **حمام**

**سونات** / sonāt ، ـها/: [فرانسوی از ایتالیایی] ☜ **سُنات**

**سوند** / sond/: [فرانسوی] ☜ **میل ـ٢**

**سونداژ** / sondāj/: [فرانسوی] ☜ **سُنداژ**

**سونوگرافی** / sonog(e)rāfî/: [فرانسوی] *اسم.* [پزشکی] سنۆگرافی؛ سونۆگرافی: ١. بەکاربردنی شەپۆلی ژوورەدەنگ بۆ دیاری دانی جێی پێکهاتەگەلی نێو لەش (وەک بەردی گورچیلە یان تۆلی نێو پزدان): **اُلتراسونوگرافی** ٢. ـها/ ڕێخراوە یان بەشێ کە ئەم کارەی تێدا دەکرێ ‹بخش سونوگرافی: بەشی سونۆگرافی›.

**سونولژیست** / sonolojîst ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* سنۆلۆژیست؛ بژیشکی پسپۆڕی سنۆگرافی.

**سوهان** / sowhān, so:hān ، ـها/: *اسم.* ١. بربەند؛ برپەن؛ بڕوەن؛ برپەنگ؛ مرمەند؛ بربەنگ؛ نەربەند؛ ڕنەک؛ سوان؛ قەورە؛ قەڵبە؛ کارتیک؛ کارتیغ؛ کارتیخ؛ کارتی؛ کارتێ؛ خورۆک؛ چووەسۆ؛ مەورە؛ مەورەت؛ مورەت؛ مۆرەت؛ مەوەرد؛ مەورەد؛ مووڕەد؛ ئامرازێ (زۆرتر) لە پۆلا بە بیچمی سێسووچ، چوارسووچ، مێڵەیی گرد یان تەختەۆە کە گشت یان بەشێک لە ڕووەکەی گرنج ـ گرنج یان زوورە و بۆ ڕنین یان سوونی چێو یان کانزا کەڵکی لێ دەگرن ٢. [از هندی؟] سۆهان؛ سەوهان؛ جۆرێ شیرینی کە بە ئاردی گوڵەگەنم، ڕۆن و شەکر (هەنگوین یان شیلە) دروستی دەکەن.

◙ **سوهان روح**: [مجازی] بەڵای گیان؛ مێملی گیان؛ ئەوەی هۆی ئازاری هەمیشەیی ڕۆح و گیانە.

**سوهان عسلی**: سۆهانی هەنگوێنی.

◘ **سوهان زدن**: سواندن؛ قەراندن؛ لە بربەند دان؛ مۆرەت لێدان.

**سوهان‌پز** / sowhānpazî, so:hān- ، ـها/: [از هندی/ فارسی] *اسم.* سۆهان‌پێژ؛ ئەوی کاری درووست‌کردنی شیرینی سۆهانە.

**سوهان‌پزی** / sowhānpazî, so:hān-/: [از هندی/ فارسی] *اسم.* سۆهان‌پێژی: ١. کار یان پیشەی سۆهان‌پێژ ٢. دووکان یا کارەگای سۆهان‌پێژان.

**سوهانکاری** / sowhānkārî, so:hān-/: *اسم.* بروەنکاری؛ بربەندکاری؛ کاری ساودانی کانزا. هەروەها: **سوهانکار**

**سوی** / sûy/: *اسم.* [ادبی] لا؛ لایەن؛ نک؛ ئالی.

**سویا** / soyā ، ـها/: [انگلیسی/ فرانسوی از هلندی] *اسم.* سوویا؛ سۆیا؛ سووژا: ١. گیایەکی ئالیکی یەک‌ساڵە بە لاسکی داپۆشراو لە هەودای سپی، گەڵای ناوەـ ناوە و پێکهاتوو لە سێ گەڵاچک، گوڵی سپی ئاماڵ بنەوش، بەری بە کالانگەلێ درێژ کە دوو تا پێنج دەنکی وەک نۆکی تێدایە

و له بڕێ جۆری ڕۆن دەگرن ٢. دانەی ڕۆن گیراوی ئەم گیایە کە وەک پێخۆر دەخورێ.

**سویابی** / sûyābî ، ـها/: *اسم.* لادۆزی؛ لایەن‌دۆزی؛ کار یان ڕەوتی دۆزینەوەی لایەنی دلخواز.

**سویت** / suvît/: [فرانسوی] ☜ **سوئیت ـ٢**

**سویچ** / suvîč ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* سویچ؛ کلیل؛ ئامرازی خستنە ڕێی برێ دەزگا یان هەلکردنی خولگەیێ ‹سویچ ماشین: سویچی ماشین›: **سوئیچ**

**سویچی** / suvîčî/: [انگلیسی] *صفت.* سویچی؛ سوویچدار ‹قفل سویچی: قولفی سویچی›.

**سویچینگ** / suvîčîng/: [انگلیسی] *اسم.* ١. کار یان ڕەوتی خستنە ڕێی دەزگا یان ماشین ٢. دەزگای قت یا هەلکردن یا گۆڕانی خولگە.

**سه**[١] / se/: *اسم.* سێ؛ یەرێ؛ هیرە؛ هیریە؛ ژمارەی سەرەکی نێوان دوو و چوار.

**سه**[٢]: *صفت.* سێ؛ یەرێ؛ هیرە: ١. یەکێ زۆرتر لە دوان ‹سه کتاب: سێ کتێب› ٢. سێهەم؛ سێیەم؛ سێ‌هیر ‹درجەی سه: پلەکی سێ›.

**سه ـ**[٣]: *پیشوازه.* سێ ـ؛ یەرە ـ؛ بە سێ دانە لە شتێ ‹سەخوابە: سێ‌خەوە›.

**سها** / sohā/: [عربی] *اسم.* *[نجوم]* ئەستێرەیەکی کزی نێزیکی کارەمێ، لە وێنەی گەردوونی ورچی گەورەدا کە سۆمای چاویان پێ تاقی دەکردەوە.

**سهام** / sahām/: [عربی] جمعِ ☜ **سَهم**

**سهامدار** / sahāmdār ، ـها؛ ـان/: [عربی/فارسی] *اسم.* بەشدار؛ هاوبەش؛ هەمبەش؛ خاوەن بەش؛ هەریەکە لەو کەسانە لە دامەزراوەیەکی ئابووریدا بەشیان هەیە ‹او هم در آن شرکت سهامدار است: ئەویش لەو بەشدارگەیەدا بەشدارە›.

**سهامی** / sahāmî/: [عربی] *صفت.* بەشکۆ؛ هاوبەشی؛ بەش ـ بەش؛ تایبەتمەندی بەشدارگەیێ کە سەرمایەکەی بە چەن پاژ دابەش بووە ‹شرکت سهامی: بەشدارگەی بەشکۆ›.

**سه‌بخشی** / sebaxšî/: *صفت.* سێ‌بەشی؛ سێ‌پاژی؛ یەرەبەشی.

**سه‌بر** / sebar/: *صفت.* سێ‌بەر: ١. *[نامتداول]* سێ‌لا؛ سێ‌پاڵ ‹شکل سه‌بر: نژمی سێ‌بەر› ٢. سێ‌پاڵ؛ سێ‌گۆش؛ یەرەموور؛ سێ‌نەبش ‹خانەی سه‌بر: ماڵی سێ‌پاڵ›.

**سه‌بعدی** / sebo'dî ، ـها/: [فارسی/عربی] *صفت.* سێ‌لایی: ١. سێ‌لایەنی؛ بە درێژایی، پانایی و بەرزی؛ خاوەن بارستایی ‹جسم سه‌بعدی: تەنی سێ‌لایەنی› ٢. شیاو بۆ نواندنی وەها دۆخێک ‹تصویر سه‌بعدی: وێنەی سێ‌لایی›.

**سه‌پایه** / sepāye ، ـها/: *اسم.* سێ‌پا؛ سێ‌پایە؛ سێپک؛ سێ‌پێ: ١. کەرستەیێ بە سێ‌لاقەوە بۆ لە سەر دانیشتن ‹سه‌پایه را کشید جلو و رویش نشست: سێپاکەی کێشایە پێشەوە و لە سەری دانیشت› ٢. کەرستەیەک بە سێ‌لاقەوە بۆ شت لە سەر نان ‹سه‌پایه‌ی نقاشی: سێپایەی وێنەکێشی› ٣. کلاف؛ ئالقەی دەستەداری کانزایی بۆ ڕاگرتن و دەست پێوەنەدانی لیوان و ئیسکان.

◙ **سه‌پایه‌ی نقاشی** ☜ **نقاش ـ١**

**سه‌پشته** / sepošte/: *قید.* سێ‌ڕیز؛ سێ‌ڕیزە؛ سێ‌ڕزە؛ سێ‌ڕێچکە؛ سێ‌چین؛ یەرەچین؛ لە سێ ڕیزی لە دووی یەکدا ‹مردم سه‌پشته ایستاده بودند: خەڵکی سێ‌ڕیز وەستابوون›.

**سه‌پلشت** / sepelešt/: *اسم.* ١. سێ‌جک؛ سێ‌جگ؛ دۆخێک لە قاپێندا کە قولکەی هەموو قاپەکان بەرەو ژوور بێ ٢. *[کنایی]* قۆرت؛ کۆسپ؛ تەگەرە؛ نامەتی؛ نەهامەتی؛ باری یەکجار ناڵەبار * **سپلشت؛ سپلشگ**. هەروەها: **سه‌پلشت آمدن؛ سه‌پلشت آوردن**

**سه‌پهلو** / sepahlû ، ـها/: *اسم.* سێ‌پاڵوو؛ سێ‌سووچ.

**سه‌تار** / setār ، ـها/: *اسم.* سێ‌تار؛ سازی ژێداری ئێرانی بە چوار تاڵەوە وەکوو تاری چکۆلە کە بە نینۆک دەژەندرێ و پێشتر سێ سیمی هەبووە.

**سەجهانی** / secahānî/:/اسم. سێ‌جیهانی؛ ئامۆژەیەکی سیاسی لە دەیەکانی ١٩٦٠ تا ١٩٧٠دا کە ولاتانی دنیای بە سێ گرۆ (ئامریکا و سۆڤیەت، ولاتانی پیشەیی و ولاتە نەدارەکان) دابەش دەکرد.

**سەچرخە** / sečarxe ، ـها/:/اسم. سێ‌چەرخ؛ سێ‌چەرخە؛ سێ‌قول: ١. پێگۆزێک بە سێ چەرخەوە کە بە پالێدان دەجوولێ، بەتایبەت بچووکەکەی لیستۆکی مندالانە ٢. هەر چەشنە پێگۆزی بە سێ چەرخەوە.

**سەراه** / serāh/:/اسم. سێ‌ڕا؛ سێ‌ڕێیان؛ شوێنێ لە ڕێگا کە دەبێتە دوو پەلەوە و بەرەو دوو لا دەچێ ‹سەراه بیجار: سێ‌ڕای بیجار›.

**سەراهە** / serāhe/ ☜ **سەراهی**

**سەراهی** / serāhî ، ـها/:/اسم. ١. *[گفتاری]* سێ‌ڕێیان؛ سێ‌ڕیان ٢. سێ‌ڕا؛ لوولەیێکی بچووک کە سێ‌زارکی هەیە و بۆ پەل‌پێدانی لوولەیێ بەکاردێت ٣. *[برق]* سێ‌ڕا؛ ئامرازێ لە ماکێکی لێپارێز (پلاستیک یان کائوچۆ) بە سێ پریزی جیاکارەوە بۆ لێدانی سێ‌دەزگای بەرقی پێکەوە ‹دوشاخە را بزن بە سەراهی: دووشاخەکە بدە لە سێ‌ڕا› ❋ **سەراهە**

**سهرە** / sehre ، ـها/:/اسم. سەیرە؛ مەلی خۆشچڕی وەک چۆلەکە بە دەندووکی کورت و پەلی زەردی تێکەلاو بە سەوز، لە بان زەمین و سەر دار و بتەوە هێلانە دەکا و بڕێ‌جار لە مێرووان دەخوا، نێر و ماکەی لە یەک ناکەن و بێجگە کاتی زا و زێ بە کۆمەل دەژین.

**سەسو** / sesû/:/اسم. سێ‌گۆش؛ سێ‌سووچ.

**سەشنبە** / sešambe, -šanbe ، ـها/: [فارسی/ آرامی]/اسم. سێ‌شەمە؛ سێ‌شەم؛ یەرەشەمە؛ سێ‌شەمبێ؛ ناوی ڕۆژی چوارەمی حەفتەی ئێرانی نێوان دووشەمە و چوارشەمە.

▣ **سەشنبە عاشق، چهارشنبە فارغ**:*[کنایی]* تاوتاوی؛ دەم‌دەمی؛ هۆکی ـ هۆکی؛ حۆلحۆلی؛ حولحولی؛ عەنتەرمەزاج؛ هەر دەم لە سەر مەرامێ.

**سەشنبەشب** / sešambešab, sešanbe- ، ـها/: [فارسی/ آرامی/ فارسی]/اسم. شەوی چوارشەمە؛ سێ‌شەممەشەو؛ شەوی دوای ڕۆژی سێ‌شەمە.

**سە طلاق** / setalāq/: [فارسی/ عربی]/اسم. *[فقه]* سێ‌تەلاق؛ سێ‌مەزەوە؛ سێ‌وەسێ؛ یەرەتلاق؛ جۆرێ تەلاق کە پیاو سێ‌جار ژنی خۆی تەلاق دەدا و ئەگەر بیەوێ دیسانەوە بیخوازێ، بەرامبەر بە ئایین دەبێ پیاوێ‌تر (جاش) بێتە ئاراوە.

**سە طلاقە** / setalāqe/: [فارسی/ عربی] صفت. *[فقه]* سێ‌تەلاقە؛ سێ‌بەسێ؛ یەرەتەلاقە؛ تەلاقدراوی یەکجاری کە ئیتر گرێ نەخواتەوە، مەگەر پیاوێکی‌تر ببێ بە جاش ‹زنش را سەطلاقە کرد: ژنەکەی سێ‌تەلاقە کرد›.

**سەقلو** / sequlû, seqolû ، ـها/: [فارسی/ ترکی]/اسم. سیانە؛ هیرلەت؛ سێ گیانەوەر کە لە ڕۆژێکدا و لە دایکێکەوە زاون.

**سە کنجی** / sekoncî ، ـها/:/اسم. ١. سێ‌کونجی؛ سێ‌سووچی؛ شوێنێ بە سێ‌گۆشەوە ٢. گۆشە؛ کونج؛ سووچ.

**سەگانگی** / segānegî/:/اسم. سێ‌یانەیی؛ سێیەتی؛ سێ‌بەشی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سێ‌یانە بوون.

**سەگانە** / segāne/: صفت. سێ‌یانە: ١. بە سێ ئەندام یان سێ توخمەوە ٢. بە بار و دۆخی سێ‌بەشیەوە.

**سەگاه** / segāh/:/اسم. سێ‌گا؛ دەزگایەکی مووسیقای ئێرانی.

**سەگوش** / segûš/: صفت. سێ‌سووچ؛ سێ‌چوکل؛ سێ‌گۆش؛ سێ‌چوکلە؛ سێ‌قولینچک؛ یەرەسووچ؛ سێ‌سووک.

**سەگوشە** / segûše ، ـها/:/اسم. سێ‌گۆشە؛ سێ‌سووچە؛ یەرەگۆشە؛ سێ‌چوکل؛ سێ‌چوکلە.

**سهل / sahl**/: [عربی] *صفت. [ادبی]* سانا؛ ئاسان؛ هاسان؛ گانگاز؛ نەدژوار؛ تاقل؛ سووک؛ سۆک؛ ڕەحەت.

◘ **سهل ممتنع:** سانای چەتوون؛ شیعر یان وتەیێ کە لە بەر زۆر ڕەوان بوونی، زۆر ئاسان و ئاسایی نیشان بدا، بەڵام هۆندنەوە یان وتنەوەی وا، یەکجار دژوار بێ.

▣ **سهل بودن:** ۱. *[ادبی]* ئاسان بوون؛ سانا بوون ۲. *[گفتاری]* نەکهەر؛ نەک؛ هیچێ؛ هیچ (تەنیا بە شێوەی «سهل است» بە کار دەڕوا) ‹تو کە سهل است، جواب پدرت را هم نمی دهند: نەکهەر خۆت، جوابی بابیشت نادەنەوە›.

**سەلاچەنگ / selāčang**/: *اسم. [موسیقی]* سێلاچەنگ؛ یەکەی زەمان لە نوت نووسیدا کە درێژەی بەرامبەر بە چواریەکێکی چەنگە.

**سهل‌الحصول / sahlolhusûl, -hosûl**/: [عربی] *صفت.* سانا دەسکەوت؛ ئاسانیاو؛ بە تایبەتمەندی سانا دەسکەوتن ‹در آنجا خدمات درمان سهل‌الحصول است: لەوێ ڕاژە دەرمانیەکان سانا دەسکەوتنە›.

**سهل‌العبور / sahlol'ubûr, -'obûr**/: [عربی] *صفت.* سانابوار؛ ڕاوەرخۆش؛ بە تایبەتمەندی یا توانستی لێیەوە تێپەڕین بە ئاسانی ‹راه سهل‌العبور: ڕێی سانابوار›.

**سهل‌العلاج / sahlol'lalāc**/: [عربی] *صفت.* ساناچار؛ بە تایبەتمەندی هاسان دەرمان بوونەوە.

**سهل‌الوصول / sahlolvusûl, -vosûl**/: [عربی] *صفت.* سانا دەسکەوت؛ ئاسانیاو؛ بە تایبەتمەندی سانا و ئاسان کەوتنە دەستەوە.

**سهل‌الهضم / sahlolhazm**/: [عربی] *صفت.* سۆک؛ بە تایبەتمەندی ئاسان هەرس بوونەوە ‹غذای سهل‌الهضم: چێشتی سوک›.

**سهل‌انگار / sahlengār**/: [عربی/ فارسی] *صفت. [مجازی]* کەمتەرخەم؛ خەمسار؛ خەنۆک؛ خۆ لێبوێر؛ کەترەخەم؛ گوێنەدەر؛ بە بێ تەفرنج، پێداگری و بەدوادا چوویی لە کاردا ‹رانندەی سهل‌انگار: ئاژۆری کەمتەرخەم›.

**سهل‌انگاری / sahlengārî**، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کەمتەرخەمی؛ خەمساری؛ خەنۆکی؛ خۆ لێبوێری: ۱. ئاسان‌گری و پێداگر نەبوون ‹باید از سهل‌انگاری دست برداری و با جدیت درس بخوانی: دەبێ لە کەمتەرخەمی واز بێنی و لە سەر خوێندن سوور بی› ۲. دۆخی نەبوونی سەرنج و چاوەدێری شیاو و پێویست ‹سهل‌انگاری موجب ایجاد حریق شد: خەمساری بوو بە هۆی سووتمان›.

**سەلایی / selāyî**/: *صفت.* سێلۆ؛ سێچین؛ سێتوێ؛ سەلایە؛ هیرلا؛ هیرقات؛ سێقات ‹تخته سەلایی: تەختەی سێلو›.

**سهم / sahm**، ـها/: *اسم.* ۱. */سهام/* [عربی] بەش؛ بەشە؛ واش؛ بەری؛ وەش؛ بیەش؛ بێش؛ پەش؛ پشک؛ بەربەش؛ هەر یەکە لە پاژەگەلی پووڵ یان سەرمایە کە بەش‌ـ بەش کراوە ‹چهار سهم از ده سهم شرکت مال اوست: چوار بەش لە دە بەشی بەشدارگە ئی ئەوە› ۲. [عربی] ماف؛ بەش؛ بەشە؛ واش؛ بەری؛ بێش؛ وەش؛ بیەش؛ پەش؛ پشک؛ حەق؛ پاژێ لە شتێک کە هی کەسێکە ‹سهم من از این پول چقدر است؟: مافی من لەم پارەیە چەندە؟› ۳. *[ادبی]* سام؛ سامی؛ برووت؛ سەهم ‹سهمناک: سامناک›.

◘ **سهم امام:** *[شیعه]* مەلابەشانە؛ بەشێ لە خومس کە دەبێ بدرێ بە مەلا یا نوێنەری.

**سهم تیر:** بڕ؛ هانای گولله؛ بانترین ئاستی بەرەوگەی گولله یان هەر هاوێژراوێکی‌تر.

▣ **سهم بردن:** بەش بردن؛ بەش پێ‌گەیین؛ بەش یاوای؛ بەش بەردەی ‹در اسلام پسر دو سهم می‌برد: بەپێی ئیسلام کوڕ دوو بەش دەبا›.

**سهم دادن:** بەش دان ‹سهم او را بده!: بەشەکەی ئەویش بە!›. هەروەها: **سهم داشتن؛ سهم گرفتن**

**سهم‌الارث** / sahmol'ers/: [عربی]/اسم. بەشەمیرات؛ بەشی هەر کام لە بەش‌پێبڕاوەکانی هشتەیەک.

**سهم‌الشرکه** / sahmošškerke/: [عربی]/اسم. بەش؛ بەشەی هەر بەشدارێک لە هاوبەشگەیەک.

**سهم‌بندی** / sahmbandî/: [عربی/ فارسی]/اسم. بەشبەشی؛ بەش‌بڕی؛ کار یان ڕەوتی بەش‌کردن و ڕوون‌کردنەوەی بەشی هەر کام لە بەشداران: **تسهیم**

**سهمگین** / sahmgîn/: صفت. [ادبی] سامناک؛ بەسام؛ ساقدار؛ بسەهم؛ زەرندە؛ زۆر ترس‌هێنەر ‹انفجار سهمگین: تەقینەوەی سامناک›: **سهمناک**

**سهمناک** / sahmnāk/ ☜ **سَهمگین**

**سهمیه** / sahmîyye ، ـها/: [عربی]/اسم. بەشە؛ گوێچ؛ گیهەڤ؛ بەش؛ بیەش؛ بێش؛ پش؛ پشک؛ بەهر؛ بارە؛ پارە؛ بەرکەوت؛ بەر؛ بەشێ لە ماڵ یان کالا کە بە کەسێ یان شوێنێ دەگا ‹سهمیەی آرد نانوایی: بەشە ئاردی نانەوایی›.

**سهمیه‌بندی** / sahmîyyebandî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. دابەشکاری؛ بەشەبەندی؛ کاری دەستنیشان‌کردنی بەش بۆ تاقمێ لە کەسان یا دامەزراوەگەل.

**سه‌نظام** / senezām ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. سێ‌نیزام؛ ئامرازێ لە بیچمی سێ شەویلکەی ڕێکخراو بۆ سفت ڕاگرتنی شتێ بە سەر ئامێر یان دەزگایێکەوە.

**سهو** / sahv ، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] هەڵە؛ سەهو؛ سەهوە؛ یانش؛ ئەوەی لە ڕووی نەزانین و کەمتەرخەمیەوە ڕوو دەدا.

**سهواً** / sahvan/: [عربی] قید. بە هەڵە؛ لە ڕووی هەڵەوە ‹سهواً نامه را به شخص دیگری دادم: بە هەڵە نامەکەم دایە کەسێکی‌تر›.

**سهوالقلم** / sahvolqalam/: [عربی]/اسم. هەڵەی قەڵەم؛ هەڵەی نووسین؛ هەڵە لە نووسیندا.

**سهولت** / sohûlat, suhûlat/: [عربی]/اسم. هاسانی؛ ئاسانی؛ سانایی؛ هێسانی ‹سهولت کار: هاسانی کار›.

▣ **به سهولت**: بە ئاسانی؛ بە هاسانی؛ بە سانایی ‹به سهولت می‌توان او را پیدا کرد: بە ئاسانی دەکرێ بیدۆزیەوە›.

**سهوی** / sahvî/: [عربی] صفت. هەڵەیی؛ یانشی؛ پێوەندیدار بە هەڵەوە.

**سهی** / sahî/: صفت. [ادبی] زراڤ؛ هەڵکشاو؛ ڕاست ڕواو؛ شووش و باریک ‹سرو سهی: سەولی زراڤ›.

**سهیل** / soheyl/: [عربی]/اسم. [نجوم] گەلاوێژ؛ گەڤێژ؛ گولاوێژ؛ لاڤێژ؛ سیوەیل؛ سوەیل؛ پەرەک؛ گەشترین ئەستێرەی وێنەی گەردوونی کەشتی و دووهەم ئەستێرە گەشەی ئاسمان کە لە ژوور بەری $37^{\circ}$ی باکووریەوە نابینرێ.

**سهیم** / sahîm/: [عربی] صفت. بەشدار؛ هاوبەش؛ هامبەش؛ خاوەن‌بەش؛ شەریک. هەروەها: **سهیم بودن؛ سهیم شدن؛ سهیم کردن**

**سی**[1] / sî/: اسم. سی: ۱. هیرس؛ هیەرس؛ ژمارەی سەرەکی دوای بیست و نۆ و بەر لە سی و یەک ۲. [ایتالیایی] [موسیقی] حەوتەمین نۆتی مۆسیقا.

**سی**[2]: صفت. سی: ۱. دانەیەک زۆرتر لە بیست و نۆ دانە ۲. سیهەمین.

**سی** / sîye/: حرف. [گفتاری] بۆ؛ لۆ؛ ئەڕای؛ پەی؛ سی ‹او سیِ خودش کار می‌کند: ئەو بۆ خۆی کار دەکا›.

**سیاتیک** / siyātîk/: [فرانسوی]/اسم. ۱. دەماری سیاتیک: ☜ عصب سیاتیک، **عصب** ۲. [پزشکی] نەخۆشیەکی ژانـاوی کە بە هۆی ئاییسان یان قرنجانی دەماری هەستی پێ (دەماری سیاتیک) بەدی‌دێ و پتر لە کەمەرەوە بۆ پشت ڕان و بەرەو ئەژنۆ چڵ ئەوەشێنێ.

**سیاح** / sayyāh ، ـان/: [عربی]/اسم. گەشتیار؛ گەشتۆک؛ دنیاگەڕ ‹سیاح مشهور: گەشتیاری

ناودار).

**سیاحت** / siyāhat ، ـها/: [عربی]/اسم. گەشتیاری؛ سەیر؛ سەیران؛ گەشت: ١. جەهانگەڕی؛ جەهانگێڵی ٢. گەشت وگێڵ؛ سەیران و تەمەشا.

**سیاحتنامه** / siyāhatnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. گەشتنامە؛ بیرەوەری نووسراوی گەشتیار ‹سیاحتنامەی ابراهیم‌بیگ نخستین رمان طنز سیاسی به زبان فارسی است: گەشتنامەی ئیبراهیم بەگ هەوەڵین ڕومانی تیزوتانەی سیاسی بە زمانی فارسیە›.

**سیاخاک** / siyāxāk/: اسم. [کشاورزی] خاکەڕەشە؛ خۆڵەڕەشە؛ خۆڵی نەرم و بڕشت و نەختێ ڕەش یان قاوەیی کە لە بارن و گیاخاک و بڕێ ماکی قسڵی پێکهاتووە و بێ‌نیاز بە کووت، ماوەیەکی زۆر بەرهەم دەدا.

**سیادت** / siyādat ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. هەڤیازی؛ بەرتری؛ لە پێشی ‹ژاپن سیادت صنعتی غرب را به خطر انداخته است: ژاپون هەڤیازی ڕۆژاوای لە پیشەسازیدا خستۆتە بەر مەترسیەوە› ٢. ئاغایی؛ سەروەری؛ کوێخایی ‹زمانی انگلستان بر جهان سیادت می‌کرد: سەردەمێ ئینگلیس بە سەر دونیادا ئاغایی دەکرد›.

**سیار** / sayyār/: [عربی] صفت. گەڕا؛ گەڕۆک؛ گەڕۆڵ؛ گەڕیانۆح؛ گەڕندە؛ بێ‌وچان لە گەڕان، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر.

**سیارات** / sayyārāt/: [عربی] جمعِ ☜ **سیاره**

**سیارک** / sayyārak ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئەستێرۆکە؛ هەر یەکە لە تەنگەلی ئاسمانی چکۆلە (بە بارستایی ١,٥تا ٦٥٠ کیلۆمیتر) کە زۆرتر دە بۆشایی نێوان بارام و هورمز، بە دەوری خۆردا دەخولێنەوە: **اختروَش**

**سیاره** / sayyāre ، ـها؛ سیارات/: [عربی]/اسم. گەڕۆک؛ ئەستێرۆک: ١. هەر یەکە لە تەنگەلی ئاسمانی کە دە خولگەیەکی جەغزئاسا بە دەوری خۆردا دەگەڕێن ٢. هەر تەنێکی ئاسمانی هاوچەشن لە کۆمەڵە ئەستێرەیێکی‌تردا.

**سیاس** / sayyās ، ـها/: [از عربی] صفت. ١. [نامتداول] ڕامیار ٢. [کنایی] لێزان؛ چازان؛ بەمشوور؛ خاوەن زیرەکی و تەگبیر.

**سیاست** / siyāsat ، ـها/: [عربی]/اسم ١. ڕامیاری؛ سیاسەت؛ زانست یان زانیاری دەسەڵاتداری ٢. ڕامیاری؛ سیاسەت؛ زانیاری یان زانستێ کە لە ڕێبەری یان کارتێکەری بە سەر دەسەڵاتدا دەکۆڵێتەوە ٣. ڕامیاری؛ سیاسەت؛ کار و باری سەر بە پێوەندی دەوڵەتێک لەگەڵ دەوڵەتانی‌تردا ٤. ڕامیاری؛ سیاسەت؛ کۆمەڵەی ڕێ و چارە و ڕەوشگەلی دەوڵەت یان کەسێک بۆ بەڕێوەبردنی کار و باری خۆ ٥. هەڵویست؛ هەڵوەس؛ بەرنامە و شێوازی بنکە یان کەسێک لە بەرانبەر کۆمەڵێ بابەتەوە ‹سیاست خانەداری: هەلویستی ماڵداری› ٦. [قدیمی] سزا ‹این سه گناهکار را سیاست فرمودند: ئەم سێ تاوانکارەیان سزا دا›.

**سیاست‌باز** / siyāsatbāz ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. ڕامیارڤان؛ سیاسەت‌باز؛ کەسێ کە بۆ گەیشتن بە ئارمانجی خۆی دەس دەداتە گێرە و کێشەی سیاسیەوە. هەروەها: **سیاست‌بازی**

**سیاست‌پیشه** / siyāsatpîše ، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕامیار؛ سیاسەت‌پیشە؛ سیاسەت‌کار.

**سیاستگذاری** / siyāsatgozārî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. سیاسەتڕێژی؛ کار یا ڕەوتی دەستنیشان‌کردنی ڕاوێژ و ڕەوشگەلێکی تایبەت بۆ کار و بار؛ سیاسەت دانان ‹سیاستگذاری آموزشی نیازمند بررسی دوباره است: سیاسەتڕێژی فێرکاری پێویستی بە پێداچوونەوەیە›.

**سیاستگر** / siyāsatgar ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕامیار؛ سیاسەت‌پیشە؛ سیاسەت‌کار.

**سیاستمدار** ¹ / siyāsatmadār ، ـها؛ ـان/: [عربی] /اسم. رامیار؛ سیاسەتمەدار؛ کەسێ کە لە کار و باری پێوەندیدار بە بەڕێوەبردنی وڵاتدا بەشدارە یان دەستی هەیە.

**سیاستمدار** ²: صفت. *[مجازی]* بە سیاسەت؛ سیاسەتزان؛ بەمشوور ‹مادرش خیلی سیاستمدار است و می‌داند چطور همه را راضی نگه دارد: دایکی زۆر بە سیاسەتە و دەزانێ چۆن هەموو ڕازی بکا›.

**سیاستمداری** / siyāsatmadārî/: [عربی] /اسم. سیاسەتمەداری؛ رامیاریەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سیاسەتمەدار بوون.

**سیاسی** / siyāsî/: [عربی] صفت. رامیاری؛ سیاسی؛ پێوەندیدار یان هاوگەری سیاسەت.

**سیاق** / siyāq/: [عربی] /اسم. ١. ـ ها/ *[گفتاری]* شێواز؛ شێوە؛ ڕەوش؛ ڕەوش و چەشن؛ ڕێوشوێن ‹بە سیاق قدیم: بە شێوازی کۆن› ٢. *[قدیمی]* جۆرێ ژمارەنووسی کە لە حەسابداریدا دەچووە کار.

**سیال** ¹ / sayyāl ، ـها؛ ـات/: [عربی] /اسم. تەوش؛ هەر یەکە لەو ماکانەی ڕەوانن و بیچمی دەفر وەخۆ دەگرن.

**سیال** ²: صفت. تەوش؛ ڕەوان؛ وەگەڕ.

**سی‌ام** / sî'om, sîyom/: صفت. سیهەم؛ سیەم؛ سیوم؛ بە ڕیز، ڕزن، پلە یان جێگەی سیوە ‹نفر سی‌ام: کەسی سیهەم›.

**سیامانگا** / siyāmāngā ، ـها/: [؟] /اسم. سیامانگا؛ گیانەوەری گوانداری درەختژی و هەمووشتخۆری لە تاقمی مرۆئاسایان، بە دەست و پێی درێژ و دەنگی زلەوە.

**سی‌امی** / sî'omî, sîyomî/: ضمیر. سیهەمی؛ سیەمی؛ ئەوەی لە ڕیز، پلە یان جێگەی سیهەمدایە.

**سی‌امین** / sî'omîn, sîyomîn/: صفت. سیومین؛ سیهەمین؛ سییەمین؛ بە ڕیز، ڕزن، پلە یان جێگەی سیهەمەوە ‹من سی‌امین نفر بودم: من سیهەمین کەس بووم›.

**سیانور** / siyānûr/: [فرانسوی] /اسم. سیانوور؛ هەر یەکە لە چەند جۆرە ماکی کیمیاوی زۆر کوژەر، کە لە چێکردنی مێرووکوژان، ئاوکاری کارەبایی و دەرهێنانی زێڕ و زیودا بەکار دەڕوا: **سیانید**

**سیانوز** / siyānoz/: [؟] /اسم. *[پزشکی]* سیانۆز؛ شینوڕەش؛ دۆخی دیاریدانی ڕەنگی کەوە لە شانەگەلدا (نینۆکان، پێست و...) بە هۆی کەم بوونی ئوکسیژن.

**سیانوژن** / siyānojen/: [فرانسوی] /اسم. *[شیمی]* سیانوژن؛ گازی گڕگری ژاراوی بێڕەنگ، کە لە ئاو، ئەلکول و ئێتێردا دەتوێتەوە و بۆ بەرهەمهێنانی مێرووکوژ بەکاردێت.

**سیانید** / siyānîd/: [فرانسوی] ☜ **سیانور**

**سیاه** ¹ / siyāh/: /اسم. ڕەش؛ ڕەژ؛ سیاو؛ سییە؛ سیە: ١. ڕەنگی خەڵووز یان ئاسمانی شەوی تار ٢. ڕەنگێ کە کەمترین تیشکدانەوەی هەیە ٣. *[موسیقی]* یەکەی زەمان لە نوتنووسیدا بە درێژایی بەرانبەر بە نیوەی سپی ٤. *[مجازی]* گنجی ڕەش؛ بەرگی تازیەباری ‹هنوز سیاه می‌پوشد: هێشتا ڕەشپۆشە›.

⊡ **سیاه کسی را به تن کردن**: *[مجازی]* ڕەش پۆشین بۆ کەسێ؛ لە شینی کەسێکدا بەرگی ڕەش لە بەرکردن. هەروەها: **سیاه کسی را به تن داشتن**

**سیاه** ²: صفت. ڕەش؛ ڕەژ؛ سیاو؛ سییە: ١. سیاون؛ بە ڕەنگی ڕەش. هەروەها: **سیاه‌رنگ** ٢. *[مجازی]* چەوسێنەر ‹روزگار سیاه: ڕۆژگاری ڕەش› ٣. تاریک ‹شب سیاه: شەوی ڕەش› ٤. *[مجازی]* ناخۆش؛ دزێو ‹کارنامەی سیاه: کارنامەی ڕەش› ٥. ـان/ *[مجازی]* ڕەشپێست؛ سیاپۆس.

⊡ **سیاه بودن**: ١. ڕەش بوون؛ سیاو بیەی؛ بە ڕەنگی ڕەش بوون ‹این پارچه سیاه است: ئەم پارچەیە ڕەشە› ٢. تاریک بوون؛ لێڵ بوون

‹همه جا سیاه بود: هەموو جێیەک تاریک بوو› ٣. *[مجازی]* ڕەش بوون؛ سیاو بیەی؛ دڵتەزێن بوون ‹روزگارش سیاه بود: ڕۆژگاری ڕەش بوو›.
هەروەها: **سیاه شدن**
**سیاه کردن**: ١. ڕەش‌کردن؛ سیاوکەردەی؛ بە ڕەنگی ڕەش دەرهێنان ‹دستم را سیاه کرد: دەسمی ڕەش کرد› ٢. ڕەش‌کردن؛ تاریک کردن؛ لێڵ کردن ‹ابر روی آسمان را سیاه کرد: هەور ئاسمانی ڕەش کرد› ٣. *[مجازی]* ڕەش کردن؛ تاڵ کردن؛ پڕئازار کردن ‹فرمانده روزگارش را سیاه کرد: سەرکردە ڕۆژی لێ ڕەش کرد› ٤. *[گفتاری]* تەشقەلە خاپاندن؛ پێ کردن ‹نیموجبی می‌خواست مرا سیاه کند: بە بستێک بالاوە دەیهەویست بمحاپینێ›.
**سیاه ـ**[٢]: *پیشوازه.* سیاـ ؛ ڕەش‌ـ ؛ سیەـ ؛ ڕەشەـ: ١. بە ڕەنگی ڕەش ‹سیاه‌چال: سیاچاڵ› ٢. *[مجازی]* بە بار و دۆخی خراپ ‹سیاه‌زخم: ڕەشەبرین›.
**سیاه‌اربه** / siyāh'arbe/ ☜ **سیاه‌دار**
**سیاه‌آل** / siyāh'āl ، ـهـا/: *اسم.* بەراڵوو؛ بەرەڵوو؛ شینک؛ دار یان دەوەنێکی بەلاڵووک‌ئاسایە بە گوڵی سپیەوە کە پێش گەڵا دەرکردن دەشکۆفێ: **آل**
**سیاه‌بازی** / siyāhbāzî/: *اسم.* ١. سیابازی؛ جۆرێ شانۆی کۆن کە کەسێ نۆکەرێکی ڕەش‌پێستی گێژ و حۆلی هەیە و کاری سەیر ـ سەیر و خوش دەکا ٢. ☜ **سیاه‌بندی**
**سیاه‌بخت** / siyāhbaxt ، ـان/: *صفت. [مجازی]* ١. ڕۆژڕەش؛ سیاچارە؛ چارەڕەش؛ گەدی؛ بەخت‌ڕەش؛ کلۆر؛ کلۆڵ؛ قەرەبەخت؛ قەرەبەش ٢. بەخت‌کوێر؛ بێبەش لە ژیانی ژن‌وشوویی خۆش و بێ قرە. بەرامبەر: **سفیدبخت**
**سیاه بندی** / siyāhbandî/: *اسم. [گفتاری]* کاری ڕێکخستنی شانۆ درۆینە بۆ فریودانی کەس یان کەسانێک: **سیاه‌بازی ـ ٢**

**سیاه بهار** / siyāhbahār/: *اسم. [مجازی]* سیابەهار؛ بەهاری درەنگ کە هەوای دێر خۆش دەبێ و شینکەی دوا دەکەوێ.
**سیاه‌بید** / siyāhbîd/ ☜ بید سیاه، **بید**
**سیاهپوست** / siyāhpûst ، ـهـا؛ ـان/: *صفت.* ڕەش‌پێست؛ ڕەش‌پێس؛ قول‌هەوەش؛ سیاپۆس؛ سەربە یەکێک لە چوار گرۆی گەورەی ڕەگەزی مرۆ، ئاکنجی قورنەی ئافریقا، کە پێستێکی تاریک، مووی گرژ و لێوی ئەستووریان هەیە.
**سیاهپوش** / siyāhpûš/: *صفت.* ڕەشپۆش؛ سیاپۆش؛ سیاوپۆش: ١. خاوەن پۆشەنی ڕەش ‹مرد سیاهپوش: پیاوی ڕەش‌پوش› ٢. *[کنایی]* تازیەبار؛ ئازیەتبار ‹تمام شهر سیاهپوش بود: تەواوی شار ڕەشپۆش بوون›.
**سیاه‌پوشک** / siyāhpûšak ، ـهـا/: *اسم.* جۆرە درکێکی بیاوانی بە گوڵی زەردی جوانەوە.
**سیاه‌تخمه** / siyāhtoxme/ ☜ **سیاهدانه ـ ٢**
**سیاه‌توسه** / siyāhtûse ، ـهـا/: *اسم.* ڕەشەهەرجنک؛ هەجنەبایەم؛ ڕەشەئەرژەن؛ نەهیڤەزاگرۆسی؛ دەوەن یان دارێکی بچووکی پایا، تایبەتی ناوچەی گەرمی شێدار، بە لق و پۆی بێ‌درک، گەڵای تاکی هێلکەیی، گوڵی تاکەیی یان بە کۆمەڵ و بەری ناوکەداری سوورەوە کە دوایی ڕەش دەبێ. چێوەکەی سووکە و لە پیشەسازیدا کەڵکی هەیە: **سیاه‌توسکا**
**سیاه‌چادر** / siyāhčādor ، ـهـا/: [فارسی/ سنسکریت] *اسم.* ڕەشماڵ؛ ڕەشمار؛ کەوەندە؛ تاوڵ؛ کۆن؛ دەوار؛ سیاماڵ؛ دەواو؛ دووار؛ چادری ڕەش؛ خێوەتی ڕەشی لە موو چنراو کە کۆچەرانی تێدا دەژین.
**سیاهچال** / siyāhčāl ، ـهـا/: *اسم. [قدیمی]* سیاچاڵ؛ ژێرخانێکی تەسک و تەڕ و ترووک کە بەخسیرانیان بۆ سزا تێدا ڕادەگرت.
**سیاهچاله** / siyāhčāle ، ـهـا/: *اسم. [نجوم]*

کونەڕەش؛ تەنێ گچکەی ئاسمانی بە گۆڕەپانی ڕاکێشەری زۆر بەهێزەوە کە لە ئاکامی لێکهەڵوەشانەوەی هەسارەیێکەوە پەیدا دەبێ.

**سیاه‌چرده** / siyāhčorde/: *صفت.* ڕەشتاڵە؛ سیاچەردە؛ سیاوتاڵە؛ سیەواڵە؛ ڕەشکەڵە؛ سیوالا؛ سەوزە؛ سیاتاوە ‹جوان سیاه‌چرده‌ای در زیر درخت نشسته بود: لاوێکی ڕەشتاڵە لە ژێر دارەکەدا دانیشتبوو›.

**سیاه‌چشم** / siyāhčešm/: *صفت.* چاوڕەش؛ چەم‌سیاو؛ خاوەن گلێنەی چاوی ڕەش ‹مرد سیاه‌چشم لهجه‌ی هندی داشت: کابرای چاوڕەش زاراوەی هیندی هەبوو›.

**سیاه‌دار** / siyāhdār ، ـها/: [فارسی/ کردی] *اسم.* سیادار؛ دارێکی زل بە گەڵای هێلکەیی و دانەدار و میوەی ناوکەداری ڕەش و درشتەوە: **سیاه‌اربه؛ سیاه‌درخت**

**سیاهدانه** / siyāhdāne ، ـها/: *اسم.* سیاوڵە؛ ڕەشکە؛ کورە؛ هەبڕەش؛ هەبڕەشک؛ ڕەشکەی نان: ١. گیایەکی ئالیکی یەکساڵانی خۆڕسک، بە گەڵای هێڵ ـ هێڵی باریک، گوڵی تاکی شیری لێوارە شین و دەنکی ڕەشەوە ٢. دەنکی ڕەش، سێگۆش و بۆنخۆشی ئەو گیایە کە بۆ دەرمانیش دەشێ. هەروەها: **سیاه‌تخمه**

**سیاه‌درخت** / siyāhderaxt/ ☜ **سیاه‌دار**

**سیاهدل** / siyāhdel ، ـان/: *صفت. [مجازی]* دڵڕەش؛ دڵسیاو؛ بەدگومان؛ خاوەن دەروونێکی ڕکاوی و دڕدۆنگ: **تیره‌دل**

**سیاهرگ** / siyāhrag ، ـها/: *اسم.* سیارەگ؛ ڕەگێ کە خوێن بۆ دڵ دەگەڕێنێتەوە و جمشت و گوشاری خوێنی تێدا لە سوورەڕەگ کەمترە.

**سیاهروز** / siyāhrûz ، ـان/: *صفت. [مجازی]* ڕۆژڕەش؛ ڕۆژەڕەش؛ ڕۆژکوێر؛ کوێرەوەر؛ خاوەن ژیانی خەماوی و پڕئازار.

**سیاه زخم** / siyāhzaxm/: *اسم.* تیراوێ؛ سیازام؛ برینارەش؛ نەخوشی چڵکی هاوبەشی مرۆڤ و ئاژەڵ کە بە شێوەی کوانێکی چڵکینی ناوڕەش سەر هەڵدەدا.

**سیاه‌سرفه** / siyāhsorfe/: *اسم.* قۆتک؛ قۆزەڕەشە؛ کۆخەڕەشە؛ کۆکەڕەشە؛ کوخکاڕەش؛ سیەقوتە؛ قورباجە؛ خەندەکۆکە؛ کووکەی دوودەنگی؛ نەخۆشی چڵکی منداڵان کە بە هێرشی بە تەوژمی قۆزە و هاژەی هەناسە و یاو و درم، دیاری دەدا.

**سیاهسنگ** / siyāhsang/: *اسم.* پازار؛ بەردەڕەشە؛ جۆرێ بەردی ڕەشی وردیلە و ڕەنگاوڕەنگ: **بازالت**

**سیاه‌سوخته** / siyāhsûxte ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* ڕەش‌هەڵگەڕاو؛ ڕەشتاڵە؛ بە ڕەنگی پێستی قاوەیی یان سەوزی تۆخ ‹از چهره‌ی سیاه‌سوخته‌اش پیدا بود، اهل جنوب است: لە چاری ڕەش‌هەڵگەڕاویدا دیار بوو، خەڵکی باشوورە›.

**سیاه‌قلم** / siyāhqalam ، ـها/: [فارسی/ معرب از یونانی] *اسم.* سیاقەڵەم؛ چەشنێ وێنەکێشی کە تەنیا لە قەڵەمێکی ڕەش کەڵک وەردەگرن.

**سیاهک** / siyāhak/: *اسم.* کوێرەک؛ کوێرک؛ کیرۆ؛ کوێروو؛ کۆروو؛ ڕەشک؛ زیڤان؛ زیوان؛ زیزانە؛ زیزان؛ ناوی گشتی برێ نەخۆشی قارچی دەغڵ و دان.

**سیاهکار** / siyāhkār ، ـها؛ ـان/: *صفت. [مجازی، ادبی]* ١. بەدکار؛ خراپکار؛ تاوانبار ٢. ستەمکار؛ ناحەقی‌کار.

**سیاهکاری** / siyāhkārî ، ـها/: *اسم. [ادبی]* خراپکاری؛ بەدکاری؛ کاری ناڕەوا و پێچەوانەی بایەخگەلی مرۆڤایەتی.

**سیاهگوش** / siyāhgûš/: *اسم.* گوێڕەش: ١. ـها/ سیولۆ؛ وشەک؛ ورشەک؛ وشەگ؛ هەنگوێنخۆر؛ گیانەوەری گوهانداری ڕاوکەر لە تیرەی پشیلە، بە پێی درێژ، کلکی کورت، گوێی مەندۆڵەیی و پێستی قاوەیی ئاماڵ سوورەوە کە بە بوونی ٢٨ ددان لە باتی ٣٠ ددان، لە باقی

تیرەی پشیلە، هاوێر دەبێ ٢. *[نجوم]* وێنەیەکی کزی گەردوونی دە ئاسمانی نیوەگۆی باکووری لە نێوان وێنەی ورچی گەورە، گاریچی و دووپەیکەردا.

**سیاەمازو** / siyāhmāzû/ ☜ **بلندمازو**

**سیاەمست** / siyāhmast/: *صفت. [مجازی]* ڕەشەمەست؛ مەستی‌مەست؛ بەدمەس؛ ڕەش‌مەست؛ سیامەس؛ زەمر؛ گیز؛ مەست و کەلەلا ‹هر وقت می‌دیدمش سیاەمست بود: هەر کاتێ دەمدی ڕەشەمەست موو›.

**سیاەمشق** / siyāhmašq ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* ڕەشکەوسپیکە: ١. ڕاهێنانی خۆشنووسی بەتایبەت بە زەل ٢. دێڕێ کە بە قەڵەمی گەورە، بە شێوەی دووپات‌کردنەوەی وشە و ڕستە لە ژێر، سەر، پاڵ یان زێواری یەکتردا دەنووسرێ ٣. *[کنایی]* خۆ ڕاهێنان بەتایبەت لە کار و چالاکیەکی هونەری (وەک شیعر، پەخشان، فیلم و...) دا.

**سیاهە** / siyāhe ، ـها/: *اسم.* سیایی؛ سیاهە؛ لیستە؛ سیاهر؛ نامە یان دەفتەرێ کە ناو، ژمارە یان چەندێتی ئەندامانی تاقمێکی تێدا نووسراوە ‹سیاهەی حقوق کارمندان: سیایی مووچەی کارگێڕان›.

**سیاهی** / siyāhî/: *اسم.* ڕەشایی؛ ڕەشاتی؛ سیاوەتی: ١. ڕەشی؛ ڕەشیەتی؛ سیاوی؛ بار و دۆخی ڕەش بوون ٢. /ـها/ تاریاتی؛ تاریکی؛ تاریکایی؛ نوتەکی ‹سیاهی شب: ڕەشایی شەو› ٣. /ـها/ تارمایی؛ تیبا؛ قەرە؛ توق؛ شتێکی تاریکی ناڕوون کە بە هۆی دووری و لێڵیەوە ناناسرێ.

▣ **سیاهی چشم**: گلێنە؛ بیلبیلە؛ بێبیلکە؛ ڕەشکێنە؛ پەلەز؛ ڕەشی چاو؛ ڕەشکەی چاو؛ سیاولەو چەما.

**سیاهی لشکر** ☜ **سیاهی‌لشکر**

▣ **سیاهی رفتن چشم**: ڕەشکە و پێشکەکردنی چاو؛ چرسین؛ تەم و ڕەشایی هاتنە بەر چاو لە بەر کز بوونی سۆما یان شتێکی کوت‌وپڕ ‹چشمم سیاهی رفت و افتادم روی زمین: چاوم ڕەشکە و پێشکەی کرد و داریامەوە›.

**سیاهی زدن**: *[مجازی]* ڕەش‌کردنەوە؛ ڕەش چوونەوە؛ سیاوکەردەیوە؛ تارمایی شتێک کەوتنە بەر چاو ‹چیزی از دور سیاهی می‌زد: شتێک لە دوورەوە ڕەشی دەکردەوە›.

**سیاهی‌لشکر** / siyāhîlaškar/: *اسم.* سیایی‌لەشکر؛ ڕەشایی؛ دەستەیێ لە خەڵک کە تەنیا بۆ نواندنی چڕی و زۆری ئاپۆرە کۆکراونەتەوە.

**سیب** / sîb ، ـها/: *اسم.* سێو؛ سێف؛ سێڤ؛ سام؛ ساوی: ١. دارێ بە گوڵی چەتری، گەڵای کولکن و گەورەوە ٢. بەری ئەو دارە کە خڕ، درشت، خۆراکی، ئاودار و شیرین یان ترش و شیرینە و چەن جۆری هەیە: **سیب درختی**

▣ **سیب آدم**: *[کالبدشناسی]* قرک؛ گوێزەی ئەستۆ؛ خڕایی گەردن/ مل؛ کەڵەبابە؛ دەرپەڕیوی بەر گەروو کە بە هۆی پێک‌گەیشتنی دوو لقی تیرۆئید پێک دێ: **سیبک**

**سیب درختی** ☜ **سیب ـ٢**

**سیب زمینی** ☜ **سیب‌زمینی**

**سیب قندک**: شەکرەسێوە؛ شەکەرەسێف؛ سێف شەکەری؛ جۆرێ سێوی چکۆلەی شیرن.

**سیب گلاب**: سێفەگوڵاوی؛ سێوەلاسوورە؛ جۆرێ سێوی چکۆلەی تام و بۆنخۆش.

**سیب‌زمینی** / sîb(e)zamînî ، ـها/: *اسم.* سێفزەمینە؛ سێفەزەوینە؛ سێفزەمینی؛ سێبزەمینی؛ سێفەزەمنە؛ سێفی؛ سێفەعەرزیلە؛ سیفەڕۆک؛ سێوک؛ سێوخاکی؛ کارتێنە؛ کارتۆڵ؛ کەرتوف؛ کەرتۆپە؛ کرتۆپل؛ کرتۆفل؛ کارتۆفل؛ کەرتۆڤل؛ کرتوپ؛ کرکرووک؛ پەتاتە؛ پتات؛ پتەپتە؛ پوتێتە؛ پتێتە؛ پاکەپاکە؛ خڕکەگازوولە؛ ڕتاخ؛ هێڵەماسی؛ هێرەڵماسی؛

هێڵەرماسی؛ یارەڵماسی: ١. گیایەکی ئالیکی بە لکی ژێرخاکیەوە کە چەند چووزی بە سەریەوەیە و لە ڕوانی ئەو چووزانە لاسکێکی ئەستوور بە دی دێ، گوڵی بنەوشی ڕوون یان سپی و بە کۆمەڵ بە شێوەی هێشووی چەتراسا، گەڵای لێکدراو و میوەی خڕ و سوور و ژەهرن دەدا ٢. سەلکی ژێرزەوینی ئەو گیایە کە تەژی لە نشاستەیە و بۆ خواردنێکی هەموانیە.

**سیب‌زمینی ترشی**: سێ‌بن‌هەرد؛ سێبنەرد؛ سێبنەهەرد؛ گولەسێو؛ پەڵووک‌باخی؛ سێوەعەرزیلە؛ سێوە بن عەرزیلە؛ سێڤەرۆگ؛ سێوی بن عەرز: ١. گیایێکی ئالیکی بە لاسکی ڕێک و زبر و پەل‌ـپەل، لقی هەوایی زۆر کورت، گەڵای ساکاری تاک کە بە سەر زەویەوە دەردێ و دوو جۆر گوڵی زەردی لوولەیی لە نێوەڕاستدا دەردەکا ٢. لاسقی بن‌ئەرزی ئەو گیایە.

**سیبک** / sîbak/: *اسم.* گوێزە: ١. جۆرە سەرپێچێکی خڕی پتەوە کە تاڕادەیێ بە هەموو لایەکدا دەسووڕێ ‹سیبک فرمان: گوێزەی فەرمان›. ٢. *[گفتاری]* ☜ **سیب آدم** *[کالبدشناسی]*

**سیبل** / sîbl ، ـها/: [فرانسوی از آلمانی] *اسم.* نیشانە: ١. ئامانج؛ کێلک؛ نیشانێ ٢. تەختە یان مقەوایەکی وێنەدار یان نوانەدار کە بۆ ڕاهێنانی تیراوێژی دەکرێتە نیشانە.

**سیتی‌اسکن** / sîtîyeskan, sîtî'eskan/: [انگلیسی] *اسم. [پزشکی]* سیتی‌سکەن؛ شێوەیەک وێنەگری لە ئەندامانی لەش (وەک مێشک، گورچیلە و...) بە هۆی تیشکی نادیاری ایکس و گاما بۆ ناسینەوەی ئەندامی نەخۆش و دەرمانی نەخۆشی.

**سیخ**[1] / sîx ، ـها/: *اسم.* سێخ؛ سیخ؛ شیش؛ کاش؛ فیش؛ بژ؛ زیخ؛ شیشە: ١. میلەیەکی باریکی کانزایی و بڕێ‌جار چێوی بە نووکی تیژەوە کە پتر بۆ شت برژاندن بەکەڵک‌دێ ‹سیخ کباب: سیخی کەباب› ٢. هەر چەشنە شتێکی وەک سیخ ٣. *[مجازی]* ئەو بەشە لە شتی برژاو کە دە سیخ کراوە، یەکەی گۆشت و جگەر و... ‹از این کباب دو سیخ خوردەام: لەم کەبابە دوو شیشم خواردووە›.

**سیخ زدن**: ١. سیخ پێداکردن؛ سێخ لێدان؛ سێخ کردنە شتێکدا؛ سێخ کوا پۆرەی ٢. *[کنایی]* تێوە ژەندن؛ نەقیزە لێدان؛ تیژە دانن؛ زۆر هێنان بۆ کەسێ بۆ ئەنجامی کارێک ٣. *[کنایی]* سیخ دان؛ هەڵخڕاندن؛ زیخاندن؛ هەڵزرنگاندن؛ هاژۆتاندن.

**بە سیخ کشیدن**: ١. لە سێخ دان؛ سیخە کێشان؛ لە شیش دان؛ بلێسەکەنە کەردەی؛ سیخ کردنە شتێکدا بۆ نیانە بان ئاگر ‹کبابها را بە سیخ بکش: کەباکە لە سیخ بدە› ٢. *[کنایی]* کەباب‌کردن؛ برژاندن؛ برێژنەی.

**نە سیخ سوختن و نە کباب**: *[کنایی]* نە شیش سووتان و نە کەباب؛ بە هیچ لا زیان نەگەیشتن.

**سیخ**[2]: *صفت. [گفتاری]* ڕاست؛ ڕاس؛ سیخ؛ ڕەپ؛ قیت؛ قنج؛ قوت.

**سیخ شدن**: ڕاست بوونەوە؛ سیخ بوون؛ سنگ‌ـسنگ بوونەوە؛ گژ بوون؛ گژ بوونەوە ‹از ترس موهای سرم سیخ شد: لە حەیبەتان مووی سەرم ڕاست بووەوە›. هەروەها: **سیخ کردن**

**سیخچە** / sîxče/: *اسم.* داسگ؛ داس؛ داسووکە؛ داسوولە؛ بژانگ؛ برژانگ؛ قەلاس؛ قەلتاس؛ قەلاس؛ قەڵداس؛ سیخچە؛ قلچک؛ قلچغی گولەگەنم.

**سیخکی** / sîxakî/: *قید. [گفتاری]* ١. سێخ‌ئاسا؛ وەکوو سیخ ٢. ڕاست؛ ڕاس؛ ڕەپ؛ قوت؛ ڕەپ.

**سیخونک** / sîxûnak ، ـها/: *اسم.* زخت؛ زەخت؛ زەختە؛ زەقت؛ نەقیزە؛ نەقیزێ؛ سۆک؛ پیرەسی؛ شەبیک؛ شتێکی نووک‌تیژ و سیخ‌ئاسا، چوارپێیانی پێ دەبزوێنن یان دەڕەوتێنن.

▣ **سیخونک زدن:** تێوەژان؛ تێوەژاندن؛ تێوەژەندن؛ پێوەژەندن؛ نەقیزە دان؛ نەقیزەکوتان.

**سیخی** [1] / sîxî/: *صفت. [گفتاری]* ۱. بە سیخ؛ سیخدار ۲. ڕاست؛ قیت؛ قنج؛ قوت.

**سیخی** [2]: *قید.* ۱. سیخێ؛ سیخێک؛ سێخێو؛ بلێسکێوە؛ هەر سیخ ‹کباب سیخی چند؟: کەباب سیخێک چەندە؟› ۲. ڕاست؛ قوت؛ بە شێوەی قیت و ڕەپ.

**سید** / sayyed, seyyed ، ـها؛ سادات/: [عربی]/*اسم.* سەیی؛ سەید؛ سەی؛ سێ؛ ئەوی لە تۆرەمەی پێغەمبەری ئیسلام بێ.

**سیدریت** / sîdrît/: [؟]/*اسم. [کانی‌شناسی]* سیدریت؛ کەربوناتی سروشتی ئاسن؛ جۆرێ پۆلای سروشتی کە لە پۆلای دەسکرد قایم‌ترە.

**سیده** / sayyede, seyyede ، ـها/: [عربی]/*اسم.* سەیژن؛ سەیزادە؛ سەیزا؛ ژنێ کە لە تۆرەمەی پێغەمبەری ئیسلام بێ.

**سی.دی.** / sî.dî ، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* سی.دی.؛ کەرستەیەک بە شێوەی پەڕەیەکی گرد و ناسکی پلاستیکی بۆ گلدانەوە و گواستنەوەی زانیاری کەمپیۆتر (بە دەنگ و ڕەنگ و نووسراوە): **دیسک فشرده، لوح فشرده**

**سیر** / siyar/: [عربی] جمعِ ☜ **سیرت**

**سیر** / sayr/: [عربی]/*اسم.* گەشت: ۱. گەڕانە؛ ڕەوت؛ کار یا ڕەوتی ڕۆیشتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر ‹سیر صعودی: گەڕانەی هەڵچۆ› ۲. سەیر؛ گەشت؛ نۆرە؛ گەڕان و تەماشا؛ گەشت و گێڵ؛ سێل ‹سیر آفاق و انفس: سەیری خەڵک و ولاتان›.

▣ **سیر باطن:** *[مجازی]* گەشتی دەروون.

**سیر تکاملی:** ڕەوتی گووران؛ ڕۆشتن بەرەو پێگەیشتن و کامڵ بوون.

**سیر صعودی:** ڕەوتی هەورازی؛ چوون بەرەو بان.

**سیر قهقرایی:** ڕەوتی دواوەکی؛ بزاوی پاشەکشانە و بەرەودوا؛ گەشتی دواگەڕی.

**سیر نزولی:** ڕەوتی خوارەکی؛ جووڵانەوە بەرەوخوار.

▣ **سیر آفاق و اَنفُس کردن:** *[ادبی]* شار و ولاتان گەڕان و لە کار و باری خەڵک ڕامان.

**سیر کردن:** ۱. گەڕان؛ گەشت کردن؛ گەشت و گێلان؛ کەوتنە ڕێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌دی ۲. *[گفتاری]* ڕوانین؛ نوارین؛ تەواشاکردن؛ سەیرکردن.

**سیر** [1] / sîr ، ـها/: *اسم.* سیر: ۱. یەکەی کێشان بەرانبەر بە ۷۵ گرەم ۲. سیرێ؛ سیرۆک؛ سیرک؛ گیایەکی ئالیکی بە سەلکی هەڵتۆقیوی بن‌ئەرزیلەی لەتکە جیاوازی لە ناو کاژی ناسک و سپی، بە گەڵای هێلکەیی نووک‌تیژ و گوڵی سپی چەتریەوە ۳. سەلکی ئەم گیایە کە کەڵکی خۆراکی و دەرمانی هەیە.

▣ **سیر کوهی** ☜ **والک**

**از سیر تا پیاز:** *[مجازی]* نووک و بەد؛ ورد و درشت؛ خاس و خراو؛ سەرتا خوار؛ هەموو بابەتێ بە وردی ‹نشست و از سیر تا پیاز ماجرا را برایم تعریف کرد: دانیشت و نووک و بەدی ڕووداوەکەی بۆم گێڕاوە›.

**سیر** [2]: *صفت.* سێر؛ تێر: ۱. مڕ؛ تەسەل؛ مرد؛ مڕ؛ بێ‌نیاز لە شتێک بە هۆی بەهرەمەندی لەو شتە بێ کەم‌وکووڕی ‹از غذا سیر شدن: تێر بوون لە چێشت› ۲. *[مجازی]* بێزار؛ وەڕەز ‹از زندگی سیر شدن: لە ژیان تێر بوون› ۳. تۆخ؛ بە ڕەنگی یەکدەست، خەست وخۆڵ و تاریکەوە ‹قهوەای سیر: قاوەیی توخ›.

▣ **سیر شدن:** تێر بوون؛ سێر بیەی: ۱. تەسەل بوون؛ مڕ بوون ۲. *[مجازی]* بێزار بوون.

**سیر کردن:** تێرکردن؛ سێرکەردەی: ۱. بە ئەندازەی بەسندە چێشت بە کەسێ دان ۲. بێ‌نیازکردن ۳. *[کنایی]* لێ‌بێزار بوون؛ چنە

بیزنەی.

**سیر**[3]:*قید.* تێر؛ سێر؛ تێر و تەسەل؛ سێر و پەڕ ‹می‌خواهم سیر نگاهت کنم: دەمەوێ تیر لێت بڕوانم›.

**ـ سیر**[4]: *پیواژه.* ــ سێر؛ ـ یان؛ جێ ‹گرمسیر: گەرمەسێر›.

**سیرائی** / sîrā'î/ ☜ **سیرایی**

**سیراب** / sîrāb/: *صفت.* تێراو؛ پاراو؛ بەش‌بردوو لە ئاوی پێویست.

◘ **سیراب بودن:** ترهان؛ پاراو بوون؛ تێراو بوون؛ تەڕ و بڕ بوون. هەروەها: **سیراب شدن؛ سیراب کردن**

**سیرابی** / sîrābî/:*اسم.* ١. /ـها/ ورگ؛ کرش؛ ئەشقەمە؛ هوور؛ هێلگ ٢. کیپا؛ گیپا؛ کیپار؛ گیپار؛ گیپێ؛ گیپاڵ؛ گیپە؛ پێخۆرێ کە لە ورگ دروست دەکرێ ٣. پاراوی؛ تێراوی؛ سەقا؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی تێراو بوون.

**سیرایی** / sîrāyî/:*اسم. [گفتاری]* تێری؛ سێری؛ تەسەلی ‹این بچه اصلاً سیرایی ندارد: ئەم مندالە خۆ تێری بۆ نیە›: **سیرائی**

**سیرت** / sîrat ، ـها؛ سِیَر/: [عربی]*اسم. [ادبی]* مۆنە؛ هو؛ خوو؛ خدە و ئاکار ‹صبر کن ای دل! که صبر سیرت اهل وفاست: سەبرکە گیانە! سەبر مونەی ئەهلی وەفایە›. هەروەها: **سیره**

◘ **بی سیرت کردن:** *[گفتاری]* خراپ‌کردن؛ بێ‌ئابڕووکردن؛ ئیلاقەکردنی کچ یان ژن.

**سیرترشی** / sîrtoršî/:*اسم.* ترشی سیر؛ تورشی سیر.

**سیرچشم** / sîrčešm, -čašm ، ـان/: *صفت. [مجازی]* چاوتێر؛ بێ‌واز و نیاز لە شتێ.

**سیرخواب** / sîrxāb/: *صفت. [مجازی]* تێرخەو؛ تێرەخەو؛ سێروەرم؛ بێ‌نیاز بە خەو لە بەر زۆر نووستن.

**سیرداغ** / sîrdāq/:*اسم.* سیرداخ؛ سیری وردکراو و لە ڕۆندا سوورەوەکراو.

**سیرسیرک** / sîrsîrak ، ـها؛ ـان/:*اسم.* سریلە؛ سیرسیر؛ سیرسیریلە؛ سیسرگ؛ سیسری؛ سیسرک؛ مێرووویەک بە لەشی قوڵ و تۆخ، شاخی درێژ و مەچەکی چواربەندی، بڕێکیان بێ‌باڵ، کە پتر لە سەر پێی دواوە دەبزوون و لە ژێر خۆڵ یان ماکی دارزیو یا گژ و گیاوە گەرا دەکەن.

◘ **سیرسیرک خانگی:** بەرسورکە؛ ڕوولک؛ سوڕسوڕ؛ سوڕسوڕە؛ سفرەبڕە؛ سفرەفڕە؛ سیسرە؛ سیسرک؛ سیسرگ؛ مەشکەدڕ؛ سیرسیرەمای؛ سەیلەماڵی؛ سیسەرگی.

سیرسیرک درختی: سیسرە؛ چرچرک؛ شیرشیرە؛ جۆرێ سیسرک کە لاسکی گیا دەسمێ و گەرای تێدەکا.

سیرسیرک صحرایی: سیسرگە؛ سیرسیرە دەشتی؛ لە جۆرەکانی سیسرک کە زیان و مێملی گژ و گیایە.

**سیرک** / sîrk ، ـها/: [فرانسوی]*اسم.* سیرک: ١. شوێنی ڕانانی شانۆکی گیانەوەرانی دەستەمۆ، بەنبازان، گاڵتەجاڕان و چاوبەستان ‹رفته بودیم سیرک خیلی دیدنی بود: چووبووینە سیرک زۆر سەیر بوو› ٢. گرۆیەک کە بەرنامەی وا بەڕێوە دەبەن.

**سیرک‌باز** / sîrkbāz ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* سیرکیار؛ سیرکباز؛ هونەرمەندی شانۆگێڕ لە سیرکدا.

**سیرم** / sîrom/: [از کردی]*اسم. [قدیمی]* سیرم؛ سیرمە؛ دواڵ؛ دڤێل؛ دوهێل؛ دڤێت؛ زوێل؛ زۆڵە؛ زیوار؛ تەسوو؛ پارچەی لە چەرم‌بڕاو.

**سیرمانی** / sîrmānî/:*اسم. [گفتاری]* تێری؛ تێرایی.

◘ **سیرمانی نداشتن:** تێری بۆ نەبوون؛ ئاگای تێری نەزانین.

**سیره** / seyre/ ☜ **سِهره**

**سیره** / sîre/: [عربی] ☜ **سیرَت**

**سیری** / sîrî/: اسم. تێری؛ تێریەتی؛ تێرایی؛ تەسەلی؛ سێری؛ دۆخ یان چۆنیەتی تێر بوون.

**سیریلی** / sîrîlî/: [فرانسوی] ☜ خط سیریلی، خط

**سیری ناپذیر** / sîrînāpazîr/: صفت. تێری نەناس؛ بەبێ توانایی یان تایبەتمەندی تێر بوون ‹عطش سیری‌ناپذیر: تینوویەتی تێری‌نەناس›.

**سیزاب** / sîzāb ، ـها/: اسم. گازین‌گیا؛ گیاتیراوێ؛ گەری گیا؛ چەن جۆرە گیای گوڵداری هەمیشەیی، بە لاسک و گەڵای گۆشتن، گەڵای دانەدار یا خۆ بێ‌دانە و بەرامبەر بە یەک، گوڵی گچکەی سپی یان کەوەی ڕۆشنەوە.

**سیزده**[1] / sîzda(h)/: اسم. سێزدە؛ سیانزە؛ سیازدە؛ سیانگزە؛ سیزە؛ سێنزە؛ زیاردە؛ هیرێس؛ هیریەس؛ دە و سێ؛ ژمارەی سەرەکی دوای دوازدە و بەر لە چاردە.

**سیزده**[2]: صفت. ١. سێزدە؛ سیازدە؛ سیانزە؛ سێنزە؛ زیاردە؛ دانەیەک زۆرتر لە دوازدەدانە ٢. سێزدەهەم.

**سیزده‌بدر** / sîdebedar, sîzda(h)-/: اسم. سێزدەبەدەر؛ سێنزەبەدەر؛ سیانگزەوەدەر؛ سیانگزەی وەهار؛ ڕۆژی سێزدەهەمی خاکەلێوە کە لە جێژنگەلی کۆنی ئێرانیە و خەڵک لەو ڕۆژەدا بەگشتی دەچنە سەیران.

**سیزدهم** / sîzdahom/: صفت. سێزدەهەم؛ سیانزەهەم؛ بە ڕیز، پلە یان جێگەی سێزدەوە.

**سیزدهمی** / sîzdahomî/: ضمیر. سێزدەهەمی؛ ئەوەی لە ڕیز، پلە یان جێگەی سێزدەهمدایە.

**سیزدهمین** / sîzdahomîn/: صفت. سێزدەیەمین؛ سێزدەهەمین؛ سیازدەمین؛ بە پلە، ڕیز یان جێگەی سێزدەهەمەوە.

**سیستم** / sîstem ، ـها/: [فرانسوی] اسم. سیستم؛ سیستەم: ١. دەزگا؛ سامانە؛ کۆندام؛ گرۆیەک لە شت، بابەت یان دیاردەگەلی پێکەوەگیری ڕێک‌وپێک کە کۆمەڵەیەک پێک دێنن ‹سیستم متری: سیستمی میتری› ٢. نیزام؛ دوزەنە ٣. تۆڕ؛ ئەوەی بەشینەوەی شتێ یان بەڕێوەبردنی ڕاژەگەلێکی وەئەستۆوە ٤. ئەوەی (بەتایبەت لەمەڕ ماشێن و دەزگاوە) بیچم، پێکهاتە، یان شت‌ومەکی تایبەتی هەیە.

**سیستماتیک** / sîstemātîk/: [فرانسوی] صفت. سامانمەند؛ دۆزەنەدار.

**سیستول** / sîstol/: [فرانسوی] اسم. [پزشکی] سیستۆل؛ قۆناخی وێکهاتنەوە و کرژبوونەوەی دڵ لە خولێکی کارکردنیدا.

**سیسموگراف** / sîsmog(e)rāf ، ـها/: [فرانسوی] اسم. لەرەنگار؛ لەرزەنگار؛ ئامرازێ بۆ ناسین و نووسینی شەپۆلی لەرە، بەتایبەت لەرەی بوومەلەرزە.

**سیسمولژی** / sîsmolojî/: [فرانسوی] اسم. لەرەناسی؛ لەرزەناسی؛ زانستی لێکۆڵینەوە سەبارەت بە بومەلەرزە و لەرەگەلی دەسکرد.

**سیسمومتر** / sîsmometr ، ـها/: [؟] اسم. لەرەپێو؛ لەرزەپێو؛ ئامرازی ئەندازەگرتنی ڕادە و مەودای لەرە.

**سیسمونی** / sîsmonî/: [از سنسکریت] اسم. جل و پێداویستی کۆرپە، کە لە لایەنماڵی دایکەوە پێش لە دایک بوونی بە دیاری بۆی دێنن.

**سی.سی.** / sî.sî/: [انگلیسی] اسم. [مخفف] سی.سی.؛ سانتیمیتری چوارپاڵوو.

**سی.سی.یو.** / sî.sî.yû/: [انگلیسی] اسم. [مخفف] سی.سی.یوو.؛ بەشی تایبەتی چاوەدێری لە نەخۆشانی دڵ لە نەخۆشخانەدا ‹نیمەشب حالش به هم خورد، بردنش سی.سی.یو.: نیمەشەو حاڵی تێکچوو، بردیانە سی.سی.یوو.›.

**سیصد**[1] / sîsad/: اسم. سێسەد؛ سێسەت؛ یەرەسەد؛ هیرسەی؛ هیرەسەی؛ هیرێسەی؛ ژمارەی سەرەکی دوای دوو سەد و نەوەد و نۆ و

بەر لە سێسەد و یەک.

**سیصد**[2]: *صفت.* سێسەد؛ یەرەسەد: ١. یەکێ زۆرتر لە دوو سەد و نەوەد و نۆ دانە ٢. سێسەدەم.

**سیصدم** / sîsadom/: *صفت.* سێسەدەم؛ سێسەدوم؛ بە ریز، پلە یان جێگەی سێسەدەوە.

**سیصدمی** / sîsadomî/: *ضمیر.* سێسەدەمی؛ سێسەتەمی؛ ئەوەی لە ریز، پلە یان جێگای سێسەدەمدایە.

**سیصدمین** / sîsadomîn/: *صفت.* سێسەدەمین؛ سێسەتەمین؛ یەرەسەدەمین؛ بە پلە، ریز یان جێگەی سێسەدەمەوە.

**سی صنار** / sîsan(n)ār/: *اسم. [قدیمی، گفتاری]* ١. سی‌سنار؛ ٣٠٠ دینار؛ ئەوەندەی ٦ شایی یان ٣٠ دیناری پارەی کۆنی ئێران ٢. *[کنایی]* پارەیەکی زۆر کەم .

**سیطره** / seytare/: [عربی] *اسم. [ادبی]* دەسەلات؛ دەسچوویی؛ چیری ‹می‌خواست سیطره‌ی خود را بر مجلس همچنان حفظ کند: دەیهەویست دەسەلاتی خۆی بەسەر کۆڕدا هەروا بەردەوام ڕاگرێ›.

**سیفلیس** / sîflîs/: [فرانسوی/ انگلیسی] ☜ **سیفیلیس**

**سیفن** / sîfon ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* سیفۆن: ١. دەفرە ئاوێ کە بە داکێشانی لۆسەیێ، ئاوەکەی بە تەوژمەوە بەر دەبێتە ناو کاسەی دەساو و دەیشۆرێتەوە ٢. لوولەیێ کە بە گوشاردانی لۆسەی سەری، ئاوا کارێ دەکا ٣. *[نامتداول]* وشترگەلوو؛ وشترگەروو؛ گونجەی سوالەتی، سمنتی یان چودەنی تێک‌خراو بۆ ڕاگوێزانی ئاو ٤. لوولەیەکی چەماوە بە شێوەی ~ بە سەرێکی بەرزتر لەویتری، کە تراو لە کۆگەی سەرە نزمەکەوە هەڵدەکێشرێتە ناو لوولە بەرزەکەوە، ئەم کەرستەیە بۆ خاڵی کردنەوەی تراوی کۆگاگەلی جێ‌مەترسی وەک باکی بنزین بەکاردێ ❋ **سیفون**

**سیفون** / sîfon/: [عربی] ☜ **سیفُن**

**سیفی** / seyfî/: [از عربی] ☜ **صیفی**

**سیفیلیس** / sîfîlîs/: [فرانسوی/ انگلیسی] *اسم.* سفلیس؛ فەرنگی؛ هالۆق؛ بای بوور؛ نەخۆشیەکی کۆنی پەتایە کە تووشی ئەندامانی شەرم دێ. هەروەها: **سفلیس؛ سیفلیس**

**سیک** / sîk ، ـها/: [از هندی] *اسم.* سیک؛ ئایینێک لە هیندوستان؛ شوێنکەوتووانی ئایینی «وشنۆ» کە لقێک لە دینی بوودایە.

**سیکل** / sîkl ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* چەرخە؛ خول: ١. ماوەکاتێ کە زنجیرەڕووداو یان دیاردەگەلێکی تێدا ڕوو دەدا ‹سیکل کربن: چەرخەی کەربون› ٢. دەورە؛ ماوەیەکی دیاریکراو بۆ جێبەجێ بوونی کارگەلێک ‹سیکل اول: خولی یەکەم›.

⊡ **سیکل کربن** ☜ چرخەی کربن، **چرخه**

**سیکلامن** / sîklāmen/: [فرانسوی] ☜ **نگونسار**[1]

**سیکلمه**[1] / sîklame/: [از فرانسوی] *اسم.* ١. ☜ **نگونسار**[1] ٢. پەمەیی بە بنەڕەنگێکی بنەوشەوە.

**سیکلمه**[2]: *صفت.* بە ڕەنگی پەمەیی بنەڕەنگ بنەوش.

**سیگار** / sîgār ، ـها/: [فرانسوی از اسپانیایی] *اسم.* سگار؛ سیار؛ سیغار؛ جگەرە؛ جگارە؛ جغارە؛ جغەرە؛ توتنی دەکاغەزەوە پێچراو بۆ کێشان.

⊡ **سیگار برگ**: جگەرەی بەرگ/ گەڵا؛ گەڵا توتنی لێکەوەپێچراو بۆ کێشان.

⊡ **سیگار پیچیدن**: لا پێچان؛ سیغار/ جگەرە/ سیگار پێچانەوە؛ جگەرەرە پێچنەی؛ تووتن بە کاغەزکردن و سازکردنی سیگار.

**سیگار کشیدن**: سیغار/ جگەرە/ سیگارکێشان/ خواردن؛ جگەرەکێشای/ کێشتەی؛ هەڵمژینی دووکەڵی جگەرە ‹جوان کم‌سالی

ایستاده بود و داشت سیگار می‌کشید: لاویژه‌یه‌ک وه‌ستا بوو خه‌ریک بوو سیگاری ده‌کیشا›.

**سیگاری**[1] / sîgārî ، ـها/: [فرانسوی]/اسم.
۱. سیگاری؛ سیگارفرۆش؛ جگه‌ره‌فرۆش
۲. غه‌رغه‌ره‌ی به‌نی باریک و درێژ.

**سیگاری**[2] /ـها/: صفت. سیگاری؛ سگاری؛ سیاری؛ جغاره‌کێش؛ جغاره‌خۆر؛ جغه‌ره‌خۆر؛ جغه‌ره‌کێش؛ جگه‌ره‌خۆر؛ جگه‌ره‌کێش؛ ئالووده‌ی سیغار ‹من سیگاری نیستم: من سیگاری نیم›.

**سیگما** / sîgmā/: [یونانی]/اسم. سیگما:
۱.هه‌ژده‌هه‌مین پیتی ئه‌لفوبێتکه‌ی یوونانی «δ»: **زیگما**

**سیگنال** / sîgnāl ، ـها/: [فرانسوی/ انگلیسی]/اسم.
سیگنال: ۱. هناره؛ هه‌وه؛ ئاماژه‌ی ده‌نگی یان تیشکی ۲. بۆق؛ فیقه.

**سیگنال‌سیستم** / sîgnālsîstem ، ـها/: [فرانسوی] /اسم. ده‌زگای ئاماژه‌که‌ر.

**سیل** / seyl/: [عربی]/اسم. لافاو: ۱. لێفاو؛ لاپاو؛ سێلاو؛ لاسامه؛ لاخێز؛ لاو؛ له‌هی؛ له‌ی؛ لێشت؛ لێ؛ لی؛ لا؛ لالاف؛ لێسه‌ر؛ لێیه؛ لوشاو؛ له‌هر ۲.*[مجازی]* شالاو؛ لێشاو؛ هه‌رشتێ که وه‌کوو کۆمایێکی زل له کتوپرا به‌رببێته‌وه ‹سیل سپاه دشمن: شالاوی سوپای دوژمن›.

⊡ **سیل** آمدن: لافاو/ سێلاو/ لاخێز هه‌ستان؛ لافاو/ سێلاو/ لاخێز هاتن؛ لاو ئامه‌ی ‹در جنوب سیل آمد و خسارات زیادی به بار آورد: له باشووردا لافاو هه‌ستا و زه‌ره‌رێکی زۆری دا›.

**سیل گرفتن**: لافاو داگرتن؛ ئاو داگرتن؛ لاپال داگرتن؛ لاوه‌ره‌گێرته‌ی ‹خیلی از زمینهای کشاورزی را سیل گرفت: لافاو زۆرێک زه‌وی و زاری داگرت›.

**سیل** / sîl ، ـها/: [؟]/اسم. ☜ **فُک**

**سیلاب** / seylāb/: [عربی/ فارسی]/اسم. لافاو؛ لێفاو؛ لاپاو؛ لالاف؛ لاشاو؛ لێشاو؛ تیژاف؛ لاخێز؛ سێلاو؛ ئاوێ که به هۆی لاوه‌وه دێ ‹سیلاب بخشی از شهر را فرا گرفت: لافاو به‌شێ له شاری داگرت›.

**سیلاب** / sîlāb ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. *[زبان‌شناسی]* برگه؛ به‌ش؛ بڕه؛ بچووکترین یه‌که‌ی زمانی په‌یڤین، دوای واج، بریتی له (لای که‌م) پیتێکی ده‌نگدار و یه‌کێکی بێ‌ده‌نگ.

**سیلان** / sayalān/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ڕه‌وانی؛ بزاڤی ماکێ شل.

**سیلان** / sîlān/: [؟]/اسم. شیره‌ی خورما.

**سیل‌بند** / seylband ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. به‌ند؛ لاوگر؛ به‌ربه‌ند یان دیوارێ که بۆ به‌رگری له هه‌لمه‌تی لافاو دروست‌کراوه.

**سیلت** / sîlt/: [؟]/اسم. *[زمین‌شناسی]* سیلک؛ خۆڵه‌به‌ردی ده‌نک‌وردی بچووکتر له زیپک و گه‌وره‌تر له ده‌نکی گڵه‌ئیربار که نزیکه‌ی ۰/۰۳ میلی‌متره و له بن چۆم و زێ و زێبارانداا به ده‌م با و ئاوه‌وه ده‌نیشێ.

**سیل‌خیز** / seylxîz/: [عربی/ فارسی] صفت. لافاوگر؛ لافاوگه؛ به تایبه‌تمه‌ندی لافاو داگرتن ‹ایجاد سد و سیل‌بند در مناطق سیل‌خیز ضروری است: دانانی به‌ند و لاوگر له ناوچه‌گه‌لی لافاوگردا پێویسته›.

**سیلر** / sîler/: [انگلیسی]/اسم. سیلێر؛ درزگر؛ هه‌ر یه‌ک له‌و ماکانه‌ی که بۆ به‌رگری یا گرتنی درز و که‌لێن، ڕووکارێکی پێ سواخ ده‌ده‌ن.

**سیل‌زده** / seylzade ، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] صفت. لافاو لێدراو؛ لافاو بردوو؛ ئاو بردوو؛ گه‌زنگاز به هۆی لافاوه‌وه.

**سیلک**[1] / sîlk/: [انگلیسی]/اسم. هه‌ورێشم؛ ئاوریشم.

**سیلک**[2]: صفت. هه‌ورێشمی.

**سیل‌گیر** / seylgîr/: [عربی/ فارسی] صفت. لافاوگر؛ به‌رلافاو؛ وه‌ره‌لاو؛ لاوداگر؛ لافاوگه؛ لێفاوگر؛

سـێلاوگر؛ سێـلگا ‹از سـاخت و سـاز در زمینهـای سـیل‌گیـر جلـوگیری شـد: لـه کردنـه‌وه‌ی زه‌ویگـه‌لی لافاوگر به‌رگری کرا›.

**سیلندر** / sîlandr ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. سـیله‌ندر: ١. گرۆڤه‌ر؛ گلیـل ٢. قاپۆره‌یـه‌کی گرۆڤـه‌ر لـه موتوری ماشێندا که پیـستوونی تێـدا ده‌بزێـوێ ٣. که‌ره‌سته و شتی گرۆڤه‌ر.

**سیلو** / sîlû. sîlo ، ـها/: [فرانسوی از اسپانیایی]/اسم. تاپو؛ که‌وار؛ کان؛ کاریتان: ١. بینایه‌کی گه‌وره‌ی گرۆڤه‌ری بۆ هێـشتنه‌وه‌ی دانه‌وێـڵه، سـیمان و وه‌ک ئه‌وانه ٢. *[کشاورزی]* چاڵێ که به گژ و گیـا پڕ ده‌کرێته‌وه و به په‌ستاوتن کپی ده‌که‌ن و بـه خاک دایده‌پۆشن هه‌تا به ترشان، پێخۆری باشتر بۆ ئـاژه‌ڵان بێتـه ده‌سـت ٣. *[گفتاری]* هـه‌مبار؛ ئه‌مبار؛ هه‌مار.

**سیلوانیم** / sîlvān(i)yom/: [؟] ☜ **تلوریُم**

**سیلور** / sîlver/: [انگلیسی]/اسم. ١. زێـو؛ نـوقره؛ کانزای هه‌واڵ زێڕ ٢. ئالیاژی مـس و نـیکڵ بـه ١% مه‌نگه‌نزه‌وه، کـه بـه زێـو بریقـه‌دار کـراوه و ده‌فر و که‌وچک و چنگاڵی لێ دروست ده‌که‌ن.

**سـیلورین** / sîlor(i)yan/: [فرانـسوی]/اسـم. سـیلوریه‌ن؛ سـێهه‌مین ده‌وره لـه خـولی پالیئۆزوییـک لـه ٤٤٠ تـا ٤٠٠ میلیـون ساڵـی له‌وه‌و پێش کـه تێیـدا هه‌وه‌ڵـین گیانـه‌وه‌رانی وشکانی ده‌رکه‌وتن، به‌ر له‌وان ژیانی گیانه‌وه‌ری له ده‌ریازی به‌و لاوه چیتر نه‌بوو.

**سیلی** / sîlî ، ـها/:اسم. زلـه؛ زلله؛ زه‌لـه؛ زیلـه؛ شـه‌په‌زله؛ شـه‌پازلله؛ شـه‌په‌زلله؛ شـه‌قازله؛ شـه‌قه‌زله؛ شـه‌قازلله؛ شـه‌قه‌زلله؛ شـه‌قه‌زیله؛ شـاپ؛ شه‌پاڵـه؛ شـه‌پاڵ؛ چـه‌ک؛ چه‌پاڵـه؛ که‌شـیده؛ که‌شـیله؛ شـرن؛ شـرماب؛ شه‌قام؛ سهنتی؛ شـه‌پۆلکه؛ شـه‌پۆلک؛ ده‌خـش؛ سـه‌تره؛ لـه‌کمات؛ لامـات؛ له‌پارچـه؛ عیـشت؛ شه‌په‌لاغه؛ شه‌پلاغ؛ شـلپاخ؛ شـه‌پلاخ؛ شـه‌پلاخه؛ شـه‌پلاخ؛ شـه‌په‌لاخه؛ شه‌پاڵـمه؛ چه‌پلاخه؛ شه‌پیله؛ شه‌ماق؛ چۆماخ؛ زه‌رپـێ کـه به له‌پی ده‌ست له ده‌م و چـاو و لاملـی که‌سـێ ده‌درێ.

▣ **سـیلی خـوردن**: زلله/ شـه‌پلاخه/ چـه‌ک خواردن؛ شه‌قه‌زله خواردن؛ که‌شیده وارده‌ی ‹من هم چند سیلی خوردم: منـیش چه‌نـد زلله‌م خوارد›.

**سیلی زدن**: زلله/ چه‌ک/ شه‌پلاخه لێـدان؛ لـه پارچه داین؛ شه‌پلاخ ده‌ی ونه‌ی ‹یک سیلی زد به صورتم: زلله‌یه‌کی دا به لاملمدا›.

**سـیلیس** / sîlîs/: [فرانـسوی]/اسـم. *[شـیمی]* سـیلس؛ ئه‌نیدریـد ئه‌سـیدی سیلیـسیک، کـه بـێ‌خه‌وشـه‌کـه‌ی سـپی یـان بـێ‌ڕه‌نگـه و بـه‌زۆری لـه سروشـتدا ده‌س ده‌کـه‌وێ، لـه چـێ‌کـردنی شیـشه، ئـامێری چـاوی، خانووبه‌ره و سواڵه‌تدا به‌کاردێ.

**سیلیـسیم** / silis(i)yom/: [فرانـسوی]/اسـم. سیلیـسیوم؛ تـوخمی کیمیـاوی ناکـانزا، بـه ژمـاره‌ی ئـه‌تومی ١٤ و کێـشی ئـه‌تومی ٢٨,٠٨ کـه لـه دوای ئوکـسیژن، زۆرتـرین توخمه و نزیـک بـه ١% لـه توێکـڵه‌ی نـه‌گۆڕی زه‌وی پێکـدێنێ: **سیلیکُن**

**سـیلیکن** / silikon/: [فرانـسوی]/اسم. *[شـیمی]* ١. /ـها/ سـیلیکون؛ نـاوی گـشتی تاقمـێ لـه لێکدراوه‌گـه‌لی ده‌سـکردی پـولیمر ٢. ☜ **سیلیسیُم**

**سیم** / seyyom/: صفت. *[گفتاری]* سێهه‌م؛ سێیه‌م.

**سـیم** / sîm ، ـهـا/:اسم. سـیم: ١. تێـل؛ تێلـه؛ تـه‌ل؛ ڕێـسه یـان تـه‌لی نـه‌رم بـۆ کـاری جۆراوجـۆر (وه‌ک گواسـتنه‌وه‌ی کاره‌بـا یـان ئیلیکترۆمیغنـاتیس)، کـه لـه کـانزا و بـه کۆتـه‌ری جیـاواز و پتـر بـه پۆشـه‌نێکی لێپـارێزه‌وه چـێ‌ده‌کـرێ ٢. *[ادبی]* زیـو؛ زێـو؛ زیڤ؛ نوقره ٣. تێل؛ تێله؛ تـار؛ تـان؛ تـاڵ یـان ژێـی ئامێرگـه‌لی مووسـیقای ژێـدار ‹سـیم

سەتار: سیمی سێتار› ٤. جۆرێک ماسی ئاوی شیرین کە لە قاسمە دەکا: **ماهی‌سیم**

▣ **سیم افشان:** سیمی چەپک؛ سیمێ کە لە چەن ڕشتەی سیمی باریک پێکهاتووە.

**سیم برق:** تێلی کارەبا؛ سیمێ پتر لە مس بۆ گواستنەوەی کارەبا. هەروەها: **سیم تلفن؛ سیم تلگراف**

**سیم خاردار:** ئاسنورک؛ ئاسندرک؛ هەسندرک؛ درکە ئاسنینە؛ تێلی وارشی درکدار.

**سیم رابط:** سیمی پێوەند؛ لەتە تێلی ڕووکێشداری سەرێک پریز و سەرێک دووشاخە، بۆ درێژترکردنەوەی سیمی کەرستەی کارەبایی و تەلەفون.

**سیم رادیو:** تیکە سیمێ ڕووکێشدار بە دووشاخەییکەوە بۆ گەیاندنی کارەبا بە ڕادیۆ. هەروەها: **سیم اتو؛ سیم تلفن؛ سیم یخچال**

**سیم زمین:** سیمی زەوی؛ سیمی ئێرت؛ ڕێسەیێ لە سیم بۆ دابین‌کردنی هێمنی لە ئامێرگەلی کارەبایی و بەرگری لە بەرق‌گرتن و زیان دیتنی ئامێرەکە، بە زەمینیەوە دەنێن.

**سیم ظرفشویی:** سیم؛ تەل فافۆن؛ هەودای کانزایی بۆ شوردن و بریقە لێ خستنی دەفر و دۆڵە.

**سیم فاز:** تێلی فاز؛ تێلێ کە لە تۆڕی بە شینەوەی کارەبای کەم تەوژمدا لە چاو ئەرز و بەدەنە ولتاژی هەیە.

**سیم کابل:** تێلی کابل؛ کابل.

**سیم نول:** تێلی نۆل؛ تێلێ کە لە تۆڕی بەشینەوەی کارەبای کەم‌تەوژمدا لە چاو ئەرز و بەدەنە ولتاژی سیفر یان زۆر کەمی هەیە.

▣ **سیم کشیدن:** ١. سیم داخستن؛ سیم‌کێشان ٢. *[مجازی، گفتاری]* چڵ‌کێشان؛ چڵ وەشانن؛ چڵ دان.

**سیمهای کسی قاتی شدن:** *[مجازی، گفتاری]* تێکچوون؛ شپرز بوون؛ شێوانی کەسێک؛ سەر لە کەسێک شێویان؛ ئاڵۆزیان؛ تووشیاری ئاڵۆزی زەینی بوون ‹سر همین قضیه سیمهایش قاطی شد: هەر لە سەر ئەو بابەتە تێکچوو›.

**به سیم آخر زدن:** *[مجازی]* چش لە هەموو شتێ کردن؛ بەتوون لێ کردن؛ بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ بارێکدا، لە هیچ نەسڵەمینەوە و موکور دەست بۆ هەموو شت بردن ‹دیدم چارەای نیست، به سیم آخر زدم و توی آب پریدم: دیم چار نیە، چشم لە هەموو شتێ کرد و بازم دایە نێو ئاوەکەوە›.

**سیما**[1] / sîmā /: [عربی] *اسم. [ادبی]* سیما؛ سەروسیما؛ سەکوت؛ ڕیخت؛ بیچم؛ سەکوم؛ دیمەن؛ پەچک؛ بەچک؛ سکە؛ سکوم؛ نموود؛ مازە؛ قەوارە؛ ئەدگار؛ ئادگار: ١. ڕوومەت؛ ڕوخسار؛ چار؛ دەموچاو؛ چڕ و چەنە؛ چڕ و چاو؛ چەهرە؛ سەحەت؛ ڕوو؛ دێم؛ ڕوی ٢. دیدار؛ تەحر؛ قەڵخەت؛ قەلافەت؛ قیافە؛ قلهـ ؛ ماعد؛ سەر و سەکوت؛ کەسم؛ تەشک؛ زەرا؛ ڕەزا؛ ڕەخت؛ تووز؛ دیامان.

**ـ سیما**[2]: *پیوازە.* ـ دیمەن؛ ـ ڕوومەت؛ ـ تووز؛ ـ نموود ‹پری‌سیما: پەری‌دیمەن›.

**سیماب** / sîmāb /: *اسم. [ادبی]* سیماڤ؛ زیو؛ زیوە؛ جیوە.

**سیمان** / sîmān /: [فرانسوی] *اسم.* چەمەنتۆ؛ چیمەنتۆ؛ چیمەنتوو؛ سمیت؛ سمنت؛ سیمان؛ گەردێ کە لە پێژرانی ئاهەک و گڵە ئیربار پێک‌دێ و بە تێکەڵ بوونی دەگەڵ ئاودا ڕەق دادەگەڕێ: **سیمان پُرتلَند**

▣ **سیمان پُرتلَند** ☜ **سیمان**

**سیمانکاری** / sîmānkārî /: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* سیمانکاری: ١. پیشەی کەسێ کە بە

سیمان کار دەکا ٢. /ـها/ کارگەی دروست کردنی بەرهەمی سیمانی. هەروەها: **سیمانکار**

**سیمانی** / sîmānî/: [فرانسوی] *صفت.* سمنتی؛ سیمانی؛ چیمەنتوویی ‹آجر سیمانی: ئاجۆری سمنتی›.

**سیمبان** / sîmbān ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سیموان؛ تێلڤان؛ کرێکارێ کە چاوەدێری سیمی کارەبا، برووسکە یان تەلەفوونی وە ئەستۆیە.

**سیم‌پوش** / sîmpûš ، ـها/: *اسم.* سیم‌پۆش؛ تێل‌پۆش؛ لوولەیەک کە کابل دادەپۆشێ و دەیپارێزێ.

**سیم‌پیچ** / sîmpîč ، ـها/: *اسم.* سیم‌پێچ؛ سیم‌لوولە؛ سیملوول؛ سیمێکی لوولپێچ کە بە هۆی تێپەڕینی کارەباوە، مەیدانی میگناتیسی بەدی‌دێنێت. **سیم‌لوله**

**سیم‌چین** / sîmčîn ، ـها/: *اسم.* سیم‌چن؛ جۆرێ ئەمۆردەست بە شەویلکەی تیژی کەوانەییەوە بۆ بڕینی سیم.

**سیمرغ** / sîmorq/: *اسم.* سیمر؛ سیمۆرغ؛ سیرنگ؛ سیمرغ؛ سیمەرخ؛ سیمرخ: ١. /ـها/ مەلێکی ئەفسانەیی کە نمانای ژیریە و دە کێوی قافدا دەژی ٢. *[نجوم]* عەنقا؛ وێنەی گەردوونی لە ئاسمانی نیمەگۆی باشووریدا.

**سیم‌فام** / sîmfām/: *صفت. [ادبی]* زێوین؛ زیوین؛ زێوی؛ زێولام؛ بە ڕەنگی زێو ‹پرتو سیم‌فام ماه بر همه‌جا گسترده بود: تریفەی زیوینی مانگ لە هەموو لاوە بڵاوەی کردبوو›.

**سیمک** / sîmak ، ـها/: *اسم.* قولاپە یان چێوی سەرچەوت کە تاڵی هەورێشمی پێ با دەدەن.

**سیم‌کارت** / sîmkārt ، ـها/: [از انگلیسی] *اسم.* سیم‌کارت؛ کارتێکی تایبەتی بۆ ڕێخستنی برێ کەرستەی کارەبایی (وەک تەلەفوون، کارتی بانکی یان قولفی کارتی).

**سیمکش** / sîmkeš ، ـها/: *اسم.* سیمکێش: ١. کەسێ کە پیشەی دامەزراندنی سیمە بۆ کاری جۆراوجۆر ٢. ئامرازێ کە زیڕینگەران تێلی زێڕ و زیوی پێ ساز دەکەن.

**سیمکشی** / sîmkešî/: *اسم.* سیمکێشی؛ کار و ڕەوتی دامەزراندنی سیم و پێداویستیەکانی لە شوێنێکی تایبەتی بۆ پێک‌هێنانی خولگە یان تۆڕێکی نوێ. هەروەها: **سیمکشی کردن**

**سیمگون** / sîmgûn/: *صفت. [ادبی]* زێوی زێوین؛ زێوینە؛ زێولام؛ زیڤی؛ سینەم؛ سیمەن؛ وەک زێو.

**سیم‌لخت‌کن** / sîmloxtkon ، ـها/: *اسم.* سیم‌ڕووتێن؛ جۆرێک ئەمبوردەست کە لێوارەی شەویلکەکانی بەرەو ناو داشکاوە و سیمی پێ ڕووت دەکەنەوە.

**سیم‌لوله** / sîmlûle/: *اسم.* ☜ **سیم‌پیچ**

**سیمی** / sîmî/: *صفت.* سیمی؛ تەلی؛ تێلی: ١. چێ‌کراو لە سیم ‹تور سیمی: تۆڕی سیمی› ٢. سیم‌دار ‹تلفن سیمی: تەلەفوونی سیمی› ٣. بە تابەنی سیمی‹دفتر سیمی: دەفتەری سیمی›.

▣ **سیمی کردن:** سیمی کردن؛ بەرگ گرتنی کتێب و دەفتەر بە تێرۆکردنی سیم لە ڕیزەکونی پەراوێزدا بە جێگەی تابەن.

**سیمیا** / sîmiyā/: [معرب] *اسم. [قدیمی]* سیمیا؛ لە زانستە کۆنەکان، کە پێیان وا بوو بەو زانستەوە وشە و ناوی وا دەست دەکەون کە بە وتنەوەیان هەر ویست و داخوازیەک جێبەجێ دەبێ و هەروەها بیر و هزری کەسانی‌تری پێ دەزانرێ.

**سیمین** / sîmîn/: *صفت. [ادبی]* زێوین؛ سیمین: ١. سیمەن؛ زیڤین؛ زیوینە؛ سێمینە؛ سینەم؛ دروس‌کراو لە زێو ‹جام سیمین: جامی سیمین› ٢. چۆڕ؛ سپی و بریقەدار وەک زیو ‹سیمین ساق: بەلەک زیوین›.

**سین** / sîn/:/اسم. سین؛ سیّ؛ ناوی عەرەبی شازدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.
**سیناپس** / sînāps ، ـها/:[فرانسوی/ انگلیسی] /اسم. *[کالبدشناسی]* شوێنی یەک‌گرتنی دوو خانەی دەماری.
**سینتیک** / sînetîk/: [فرانسوی]/اسم. *[فیزیک]* سینێتیک: ١. لقیّ لە زانستی فیزیک کە دەپەرژێتە سەر کارتێکری هێز بەسەر جوولەی تەندا ٢. کار و ڕەوتی گۆڕانکاریەکی فیزیکی یان کیمیاوی ✽ **کینتیک**
**سین‌جیم** / sîncîm ، ـها/:اسم. *[تعریض]* باس‌وخواس؛ لیّ‌پرسینەوە ‹چرا داری این‌قدر سین‌جیم می‌کنی؟: بۆ ئەمەندە خەریکی باس‌وخواس دەکەی؟›.
**سینرژتیک** / sînerjetîk/: [؟]/اسم. سینێرژیک؛ زانستیّ کە لە سەر بەشداری‌کردنی پاژگەلی سیستەمێک لە پێکهێنانی پێکهاتەگەلی شۆنی، کاتی یان کارکردی دەپەرژیّ.
**سینرژیسم** / sînerjîsm/: [؟]/اسم. هاویاری؛ ئاریکاری؛ هاوکاری.
**سینک** / sînk ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. سینک؛ کاسەی دەفرشۆری؛ لەگانی کانزایی کە لە چێشتخانەدا لە ژێر شێری ئاوەوە بۆ دەفر شۆردن دایدەنێن ٢. *[نامتداول]* لەگان؛ کاسەئاسایەک بۆ ژێری منداڵ و نەخۆش.
**سینما** / sînemā, sînamā ، ـها/: [فرانسوی] /اسم. سینەما: ١. بینایەک بە یەک یان چەند ژوورەوە بۆ ڕانانی فیلم ٢. هونەر و پیشەی سازکردنی فیلمی سینەمایی ٣. کەرەستەی شاندانی فیلم (پرۆژێکتۆر، پەردە، ئاپارات و ...).
▣ **سینمای صامت**: سینەمای بیّ‌دەنگ؛ زانیاری سازکردنی فیلمی وا کە دەنگی هونەرپیشەکانی تێدا نابیسریّ. هەروەها: **سینمای ناطق**

**سینمائی** / sînemā'î, sînamā'î/: [فرانسوی] ☜ **سینمایی**
**سینماتک** / sînemātek, sînamātek ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. سینەمایەکی بچووک کە تەنیا فیلمی هەڵکەوتە و سەرکەوتووی تێدا پیشان دەدریّ.
**سینماتیک** / sînemātîk, sînamātîk/: [فرانسوی]/اسم. سینەماتیک؛ بەشێک لە زانستی دینامیک کە لە سەر باوی شت، بەبیّ چاوکردن لە جرم یا هێز دەکۆڵێتەوە: **کیناتیک**
**سینمادار** / sînemādār, sînamā- ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. سینەمادار؛ خاوەنی سینەما.
**سینماداری** / sînemādārî, sînamā-/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. سینەماداری: ١. خاوەن سینەما بوون ٢. بەڕێوەبردنی سینەما.
**سینمارو** / sînemārow, sînamā- ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] *صفت*. فیلمباز؛ هۆگر و هۆکارە بە ڕۆیشتن بۆ سینەما ‹جوانهای سینمارو او را خوب می‌شناسند: لاوە فیلمبازەکان باش دەیناسن›.
**سینماسکوپ** / sînemā(e)skop/: [فرانسوی]/اسم. شێوەی فیلمهەڵگری بۆ شاندان بەسەر پەردەیەکی پان بە ڕێژەی پانی بە درێژایی ١ بە ٢,٥وە.
**سینماگر** / sînemāgar, sînamā- ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. سینەماوان؛ ئەوی کاری بەرهەم‌هێنان و دەرهێنانی فیلمی سینەماییە؛ سینەماکار ‹یک سینماگر فرانسوی نیز در این جشنواره شرکت داشت: سینەماکارێکی فەرانسەویش لەم میهرەگانەدا بەشدار بوو›.
**سینمایی** / sînemāyî, sînamāyî/: [فرانسوی] *صفت*. سینەمایی؛ سینمایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە سینەما ‹فیلم سینمایی: فیلمی سینەمایی›:

**سینمائی**

**سینوزیت** / sînozît/: [فرانسوی]/اسم. [پزشکی] سینۆزیت؛ ئاییسان و هەوکردنی سینووس.

**سینوس** / sînûs، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [کالبدشناسی] سینووس؛ هەلۆل و کلۆری نێوئێسکی کاپۆل کە پتر یان لەگەل ڕێگای هەناسەدا لە پێوەندیدان (وەک سینووسەکانی لووت).

**سینوسوئید** / sînûso'îd/: [؟]/اسم. [ریاضی] کەوانەی سینووسی؛ کەوانەی وەک پێل (~).

**سینه**[1] / sîne/: اسم. ١. سنگ؛ سینگ؛ سین؛ سینە؛ بەشی پێشووی لەش لە ژێر ملەوە تا ژوورەوەی سک ‹سینەاش را جلو داده بود: سنگی دابووە پێشەوە› ٢. /ـها/ سەرسنگ؛ سەرسین؛ مەمک؛ مەمە؛ چیچە؛ سینگ و بەرۆک، بەتایبەت لە ژناندا ‹سینەهای برجستەای داشت: سینگی خڕ بوو› ٣. /ـها/ [گفتاری] سنگ؛ سی ‹شربت سینە: شەربەتی سنگ› ٤. [مجازی] ناخ؛ سینگ؛ سنگ؛ دڵ؛ هەناو؛ هەناڤ ‹سینە مالامالِ درد است ای دریغا مرهمی: ناخ پڕاوپڕ داخە، ئاخ بۆ مەلهەمێک› ٥. [مجازی] یادگە؛ بەر؛ بیر؛ حافیزە ‹همە را از سینە نقل میکرد: گشتی لە بەر دەگوتەوە› ٦. سنگ؛ سنگەڵ؛ سنگە؛ بەر ‹سینەی کوە: سنگەی کێو›.

◘ **سینه به سینه:** دەمبەدەم؛ دەماودەم؛ سینەبەسینە؛ بە شێوەی ڕاگوێزانی سەر زارەکی ‹این داستان سینەبەسینە نقل شدە است: ئەم چیرۆکە دەمبەدەم هاتووە›.

◘ **سینه زدن:** سینگ‌کوتان.

**سینه سپر کردن:** [کنایی] سنگ کردنە قەڵخان؛ سنگ دانە بەر؛ لە بەرانبەر کەسێ یا هێزێکەوە ڕاوەستان و پاشگەز نەبوون ‹سالها در برابر مشکلات زندگی سینە سپر کردم و آخ نگفتم: ساڵەهایساڵ سینگم دایە بەر تەنگ و چەڵەمەی ژین و دەنگم نەکرد›.

**سینه صاف کردن:** [مجازی] ئێح کردن؛ بە کۆخ یان دەردانی هەوا، ڕێی هەناسە بەردان ‹سینەاش را صاف کرد و گفت ...: ئیحی کرد و گوتی:...›.

**سینه کردن:** [گفتاری] ١. گەل/ هەڕەوەز کردن؛ بەرهەڤکرنی دەستە یان گرۆیەک بۆ ئەنجامی کارێک ٢. وەبەر نان؛ سەر پێوەنان؛ لێکتر کۆکردنەوە و دانە بەر خۆ و برد ٣. سک دان ‹دیوار سینە کردە بود و داشت خراب میشد: دیوارەکە سکی دابوو، خەریک بوو دەڕرووخا›.

**سینه**[2]: صفت. [گفتاری] کۆم؛ داچەماو؛ کووڕ؛ بەرەو دەر چەماوە.

**سینهالی** / sînhālî/: اسم. سینهالی: ١. /ـها/ هەر یەکە لە کەسانی هۆزێ کە زۆربەی خەڵکی وڵاتی سریلانکا پێک دێنن ٢. زمانی ئەو هۆزە، لە زمانگەلی هیندو- ئێرانی.

**سینه‌بند** / sîneband، ـها/: اسم. ١. سینەبەرە؛ سینگەبەرە؛ سینەبەند؛ سینەبەن؛ مەمکەبەن؛ مەمکبەن؛ جۆرێ ژێرپۆشی ژنانە بۆ بەرگری لە داهێزانی مەمکان ٢. بەرسینە؛ وەرزین؛ سنگبەند؛ بەرە؛ بەرسینگ؛ بەرسینگە؛ بەرەک؛ بەرەی زین؛ قایش و قرووشی سنگی ئەسپ.

**سینه‌پهلو** / sînepahlû/: اسم. [گفتاری] سینەپاڵوو؛ پزوو؛ فرک؛ ئاڤسینگ؛ بەرەزام؛ ژان و برک لە سەرماوە ‹هوا حسابی سرد شدە، این کت را بپوش وگرنە سینەپهلو میکنی: هەوا بەڕاستی سارد بووە، ئەم کوتە لەبەر کە دەنا سینەپالوو دەگری›.

**سینه‌چاک** / sînečāk/: صفت. [مجازی] دڵسووتاو؛ جەرگبرژاو؛ ئەویندار زۆر بە

تاسەی خەمداگرتوو.

**سینەخیز** / sînexîz/: اسم. سنگەخشکێ؛ سینەخشێ؛ سکەخشێ؛ سکەخشکە؛ دۆخی لەش لە کاتێکدا کە هەر سەر و سنگ لە زەوی بەرز بێتەوە و ڕۆیشتن لە سەر ئانیشک بێ.

▣ سینەخیز رفتن: سنگەخشکی چوون؛ سکەخشێ کردن؛ ڕاخوشین بە سەر زەویدا بە یارمەتی ئەژنۆ، ئانیشک و سەر ئەنگوستانی پێ.

**سینەدرد** / sînedard/ ☜ **درد**[2]

**سینە راما** / sînerāmā/: [فرانسوی] اسم. سینەڕاما؛ شێوەیەکی فیلمهەڵگری کە لە سێ دووربین و چەند کەرەستەی دەنگهەڵگری کەڵک وەردەگیرێ و بە ڕووی پەردەیەکی پانی چەماوەدا و بە سێ پرۆژێکتورەوە نیشان دەدرێ.

**سینەریز** / sînerîz ، ـها/: اسم. ئاشقبەند؛ سینەڕێز؛ ملوانکەی بە کۆمەڵ شتپێوە هەڵواسراو.

**سینەزنی** / sînezanî ، ـها/: اسم. شینگێڕی؛ چەمەرە؛ تازیەباری بە خۆ کوشتن و بە سەر سینگدانەوە.

**سینەسرخ** / sînesorx، ـها/: اسم. بووکەسوورە؛ مەلێکی لە تیرەی تووکا بە سەرپشتی خۆڵەمێشی ئاماڵ ئاوی و جووچکی ڕەش و سنگ و پالی سوور و فڕینی نزمەوە.

**سینەسوز** / sînesûz/: صفت. [مجازی] جەرگسووتێن؛ جەرگبڕ؛ دڵبرژێن؛ هۆی ئازاری هەست و نەستی زۆر و درێژخایەن ‹آه سینەسوز: ئاخی جەرگسووتێن›.

**سینەکش** / sînekeš/: اسم. سینگەلان؛ سینەکێش؛ سینەکەش؛ دەسەوەنە؛ لێس؛ دەستەو هەوراز؛ جێگای بەربلاو و ڕاسا لە بەرانبەرەوە ‹سینەکش کوە: سینگەلانی چیا›.

**سینەمال** / sînemāl/: اسم. سینەخشێ؛ سنگەخشێ؛ سکەخشێ؛ خشکە بە سەر ئانیشکەوە بە شێوەیێ کە تەنیا سەر لە زەوی بەرز بێتەوە.

**سینی** / sînî، ـها/: اسم. سینی؛ سێنیک؛ تەوەق؛ تەباخ: ١. بەرکەش؛ بەرگەش؛ مەعجۆمە؛ مەجومعە؛ مەجوعمە؛ مەجمەعە؛ مەجحمە؛ یالتەبەق؛ تەبسی؛ دەفرێکی تەخت و پەل بۆ لە سەر دانان و بردنی شتومەک بەتایبەت دەفری خواردن و خواردنەوە ٢. بەرکەش؛ بەرگەش؛ مەعجۆمە؛ مەجومعە؛ مەجوعمە؛ مەجمەعە؛ مەجحمە؛ یالتەبەق؛ ئاوا دەفرێ بە ناوەڕۆکیەوە ٣. پەڕەیێ کە دە ژێر بەشێ لە کەرەستەیەک دەخرێ بۆ کۆکردنەوەی دارژاوە ٤. مەنگری؛ لەنگەری؛ دەفرێکی گرد و کەم تا زۆر گەورە لە چێو کە لە بەوەجارێدا کەڵکی لێ دەگرن ٤. [مکانیک] پاژێک لە ماشێندا.

**سینیور** / sîneyor/: [اسپانیول] اسم. سینیۆر؛ ئاغا؛ لە نازناو و سەرناوەکانی ئاغەواتی ئوروپا: **سنیور**

**سیورسات** / siyûrsāt/: [ترکی] ☜ **سورسات**

**سیویل** / sîvîl/: [فرانسوی] صفت. ناچەکداری؛ وڵاتی؛ شەخسی.

**سیە**[1] / siyah/: صفت. [مخفف، ادبی] ڕەش؛ سیاو؛ سیە.

**سیە ـ**[2]: پیشوا‌ژه. ڕەش ـ؛ سیا ـ؛ سیە ـ ‹سیەچادر: ڕەشماڵ›.

**سیەجسم** / siyahcesm/: [فارسی/ عربی] اسم. جسم سیاه ☜ **جسم**

**سیەفام** / siyahfām/: صفت. [ادبی] ڕەشتاڵە؛ سەوزە؛ ڕەشباڤ؛ ڕەشباو؛ تەخلک؛ تێلە؛ تاڵە؛ سیازندۆق؛ سیازەندۆق.

# ش

**ش** / š/: *حرف.* ش؛ نیشانەی شازدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**ش** / še/: *اسم.* ١. شـێ؛ نـاوی شـانزدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمـانی فارسـی ٢. *[مخفف]* ه ؛ ساڵی هەتاوی ‹سال ١٣١٨ ش.: ساڵی ١٣١٨ی هـ› ٣. *[مخفف]* ژ؛ ژمـارە؛ ئـەژمار ‹ش ٧٠: ژ ٧٠› (واتا: ژمارەی حەفتا).

**ـ ش** / aš, eš/: *ضمیر.* ١. ـــ ی؛ ـ ش؛ جێنـاوی ملکی لکـاو بـۆ سـێهەم کەسـی تـاک ‹دستش؛ کتابش؛ خانەاش: دەستـی؛ کتێبـی؛ یانەش› ٢. ـی/ ـ یـ؛ ـش؛ جێناوی بـەرکاری لکـاو بـۆ سـێهەم کەسی تاک ‹بردش بانه و مدتی آنجا نگهـش داشـت: بردی بۆ بانە و لەوێدا ماوەیەک ڕایگرت›.

**ـ ش** / eš/: *پسوند.* ـ شت؛ ـ ش؛ نیـشانەی نـاوی چاوگ ‹برش؛ آزمایش: برشت؛ ئازمایشت›.

**شاـ** / šā/: *پیشوازه. [مخفف]* شاه ☜ **شاه ـ٢**

**شائبه** / šā' ebe/: [عربی] ☜ **شایبه**

**شائق** / šā'eq/: [عربی] ☜ **شایق**

**شـاباش** / šābāš ، هـا/: *اسم.* شـاباش؛ شـاواش؛ پوولە؛ زەڕئەوشان؛ زەڕەوشـان؛ پارەیـێ کـە لـە زەماوەندا ئەیکەنە سـەر بـووک و زاوا یـان ئـەو کەسەیدا کە هەڵدەپەڕێ.

**شابر** / šābor ، ها/: [آلمانی] *اسم.* شـابۆر؛ بڕبـەن؛ بڕوەن؛ کەرەسەیەکی وەک مۆرەت، بە دەستە و تێخەیەکی زۆر تیژەوە بۆ لابـردنی پـرزە و وردە لکی سەر کانزا.

▣ **شابر زدن**: شابۆر دان؛ بڕبەن/ بـڕوەن لێـدان؛ تاشینی وردە لکی سەر کانزا بە بڕبەن.

**شـابک** / šābek ، هـا/: *اسم. [مخفـف]* شـابک؛ شابەک؛ ژمـارەی سـپاردە؛ ژمـارەی سـتانداری نێونەتەوەیی کتێب.

**شـابلن** / šāblon ، هـا/: [آلمـانی] *اسم.* شـابلۆن؛ کلیشە؛ کەرەسەیەک لە وێنەی پەڕەی کـانزایی یان پلاستیکی بە کون و درزگەلێکی بە شێوەی پیـت، ژمـارە یـان شکـڵی جۆراوجـۆرەوە، بـۆ نووسـینی پیـت، ژمـارە، ئەنـدازەگرتنی سـەری مەتە و...

**شابلن‌زن** / šāblonzan ، ها؛ ـان/: [آلمانی/ فارسی] *اسم.* شابلۆن‌کار؛ کلیشەکار؛ ئەو کرێکارە کـە بـە شابلۆن؛ کار دەکات.

**شـابه** / šābe/: [از عربـی] *اسم.* هاوتـا؛ هاومـاڵ؛ نیشە؛ چەشن؛ جفت؛ لەوێنە ‹شابه نـدارد: هاوتـای نیە›.

**شـابیزک** / šābîzak ، هـا/: *اسم.* بەلـەدوون؛ گیائایەمـە؛ سـێوەخووگانە؛ هـەنگوورەتاڵـە؛ هەسەن‌بـەگی؛ قیـرەگیا؛ تووڵـەزەرە؛ گیـایێکی ژاراوی لە تیرەی باینجان، بە ڕیشووی ئەسـتوور و قەڵەو و ڕەگاژۆ، گەڵای باریک و کورت، گوڵی

گەورە و تاک و قاوەیی ئاماڵ بەنەوش و بەری هێندەی گیلاسەوە کە گەییوەکانی ڕەش و بریقەدارن: **بِلّادُن**

**شاپو** / šāpo ، ـــها/: [فرانسوی]/اسم. شاپۆ؛ لەنگەری؛ شەپکە؛ جۆرە کلاوێکی پیاوانەی خرتی لێوارەگیراوە: **کلاه لگنی**

**شاتر** / šāter ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. شاتیر؛ پەردەیەکی بچووکە لە پشت دیافراگمی دووربینی وێنەگری و فیلمهەڵگری ئانالۆگەوە کە بە باز بوون و بەسرانی لە خێرایی جۆراوجۆردا، هەندی لێدانی تیشک لە سەر فیلمەکە تەکووز دەکات.

**شاتن** / šāton ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. شاتۆن؛ دەستەی پیستوون کە لەگەڵ بان و خوارکردنی پیستووندا دەجووڵێ و میل‌لەنگ لە نێو موتوردا دەسووڕێنێتەوە * **شاتون**

**شاتون** / šāton/: [فرانسوی] ☜ **شاتن**

**شاخ** / šāx/:/اسم. ۱. شاخ؛ سترۆ؛ ستروو؛ ستڕ؛ سترِه ؛ سترەهـ ؛ ئەسرۆ؛ ڕەهـ ؛ شۆق؛ شۆتە؛ قۆچ؛ کلۆچ؛ قۆلۆچ؛ قۆخ؛ هیچک؛ زیادە ئێسکی ناو هلۆڵ کە بەجووت بەسەر برێ گیانەوەرانەوە دەبینرێت ‹شاخ گاو: شاخی گا› ۲./مخفف/ لەق؛ لق؛ لک؛ شاخ؛ شاخە؛ شاتە؛ چەق؛ پەل؛ پۆ ‹شاخ گل: لەقی گوڵ› ۳./مجازی/ بەڵای گیان؛ ئەوی بتوانێت ببێتە هۆی زەحمەت و دەردیسەر بۆ کەسێکیتر ‹برایش شاخ شده: بووەتە بەڵای گیانی›.

◘ **شاخ حجامت**: ۱. کەڵەشاخ؛ شاخێ کە جاران بۆ خوێن‌گرتن لە نەخۆش بەکاریان دەبرد ۲./مجازی/ کوتەک ناو چڵپاو؛ هۆی زەحمەت و دەردیسەر.

**شاخ شمشاد**: بەژنی زراف؛ سەوڵی خەرامان؛ باڵاعەرعەر؛ بەژن لەولاو؛ بەژن‌ڕێک؛ بەژن‌باریک؛ بە بەژن و باڵا؛ باڵا نەونەمام؛ خاوەن بەژن و باڵای ڕێک‌وپێک و جوان.

**شاخ گل**: لقی گوڵ؛ پەلی گوڵ؛ لکی گوڵ.

**شاخ نبات**: شاخە نەوات.

◘ **شاخ به شاخ شدن**: شاخەوشاخ بوونەوە: ۱. شەڕکردن؛ لێک هەڵشاخان؛ تێک‌گیران؛ گژیەی ‹دیروز دامادها شاخ به شاخ شده بودند: دوێنێ زاواکان شاخەوشاخ بوون› ۲. وێک‌کەوتن؛ گەپچان؛ لێکدانی دوو کەرەسەی گواستنەوە لە ڕووبەڕووی یەکدا ‹با یک کامیون شاخ به شاخ شد: لەگەڵ کامیونێکدا شاخەوشاخ بوون›.

**شاخ توی جیب کسی گذاشتن**:/مجازی/ کەسێک دنەدان؛ پف کردنە قولی کەسێک؛ هەڵخڕاندنی کەسێک؛ کەسێک هەڵنان بۆ کارێ (بەتایبەت ململانێ لەگەڵ کەسێکیتردا) ‹داری شاخ توی جیبم می‌گذاری؟: خەریکی دنەم دەدەی؟›.

**شاخ در آوردن**:/مجازی/ شاخ دەرهێنان؛ شاخێ زنیەی؛ یەکجار سەرسوورمان ‹از این حرفش شاخ درآوردم: لەم قسەیە شاخم دەرهێنا›.

**شاخ زدن**: قۆچ تێ‌هەڵدان؛ شاخ تێ‌هەڵدان؛ شاخ لێدان؛ قۆچدان؛ قۆچ لێدان؛ شاخ وەشان؛ قۆچ وەشاندن؛ قۆچ هاویشتن؛ قۆتەی؛ شاخ شانەی؛ شەقۆن؛ بە شاخ لە کەسێ یان شتێک دان ‹مواظب باش شاخت نزند: وشیار بە شاخت لێ‌نەدات›.

**شاخ کسی را شکستن**:/مجازی/ دەمی کەسێک شکاندن؛ چاو کەسێ چەرمگەو کردن؛ بەزاندنی کەسێ یان شتێک ‹هر کس با من در بیفتد شاخش را می‌شکنم: هەر کەسێکم لێ ڕاست بێتەوە دەمی دەشکێنم›.

**شاخ و دم نداشتن**:/مجازی/ بێ‌شاخ و باڵ بوون؛ ئاسایی بوون؛ سەیر و سەمەرە نەبوون ‹این هم خانه، خانه که شاخ و دم ندارد: ئەمەیش ماڵ، ماڵ خۆ شاخ و باڵی نیە›.

**شاخ و شانه کشیدن**:/مجازی/ هەڕەشە کردن؛

هەڕەشە و گوڕەشەکردن؛ گەفاندن؛ گەفین.

**ازاین شاخ به آن شاخ پریدن:** *[کنایی]* شاخەوشاخ/ بانەوبان کردن؛ ئەم لق و ئەو لق کردن؛ لە سەر کارێک نەوەستانەوە؛ لە کارێکدا دانەمەزران؛ نەحەوانەوە: **این شاخ و آن شاخ کردن**

**این شاخ و آن شاخ کردن** ☜ **از این شاخ به آن شاخ پریدن**

**شاخابه** / šāxābe ، ـها/:اسم. ۱. سکدان و بەرەو پێش چوویی کۆمای ئاو (زەریا، زرێبار، چۆم) لە بەژدا ۲. لقئاو؛ ئاوێ کە لە کۆمای ئاوێکی گەورەتر (وەک کەنداو، زێبار یان ڕووبار) جوێ بووەتەوە.

**شاخدار** / šāxdār ، ـها؛ ـان/:اسم. قۆچدار؛ شاخدار؛ ستروۆدار ‹جانور شاخدار: گیانداری قۆچدار›.

▣ **دروغ شاخدار** ☜ **دروغ**

**شاخسار** / šāxsār ، ـها؛ ـان/:اسم. ۱. لکوپۆ؛ لقوپەل؛ پەلوپۆ؛ بەشێک لە دار کە لقوپۆی زۆری لێبووەتەوە ۲. شالق؛ لقێکی گەورە کە خۆی چەندین لقی هەیە.

**شاخص**[1] / šāxes ، ـها/: [عربی]/اسم. پێناسە: ۱. چەنینەیەکی نەگۆڕ و دڵخوازی وا کە ناسێنەری ئەندامێک لە کۆمەڵێکدایە ‹شاخص سلسیوس برای نشان دادن دما: پێناسەی سلسیووس بۆ نیشاندانی تین› ۲. ژمارەیێ کە گۆڕانی کەمینەیی لە ئاست ژمارەی پایە پیشان دەدا ‹شاخص قیمت: پێناسەی نرخ› ۳. پارامیتر ‹دما، فشار و رطوبت از شاخصهای جوّیاند: تین، تەوژم و شێ لە پێناسەگەلی کەشن› ٤. *[قدیمی]* سەعاتی هەتاوی؛ کاتژمێری ڕۆژی ٥. خەتکێشێکی پلەکدار بۆ ئەندازەگرتنی مەودای خاڵگەی نەخشەهەڵگری ٦. میل؛ دەمەیێ کە ژمارە، لا یان بەرەو شوێنێک پیشان دەدات ۷. نیشاندەر؛ پێشاندەر؛ نوانە؛ پێنوێن ۸. پێوانە؛ پێومان؛ پێوەر.

**شاخص**[2]: *صفت.* هەڵکەوتە؛ هەڵکەوتوو؛ بەرچاو؛ دیار؛ گرۆبەر ‹او در میان همکارانش شاخص بود: ئەو لە نێو هاوکارەکانیدا هەڵکەوتە بوو›.

**شاخک** / šāxak ، ـها/:اسم. شاخەک: ۱. هشکەر؛ شاخ؛ زێدەیەک لە بان سەری میرووان، هەزارپێیان و سەختپێستانەوە کە وەک ئەندامێکی هەستیار کار دەکا ۲. قۆچکە؛ شاخۆچکە؛ چووکەڵە قۆچ ۳. چڵ؛ پۆ؛ شاتە؛ لکی گچکەی دار.

**شاخکدار** / šāxakdār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* شاخەکدار؛ قۆچکەدار؛ شاخۆچکەدار؛ هشکدار؛ بەهشک.

**شاخوبرگ** / šāx-o-barg ، ـها/:اسم. لەقوپۆپ؛ لقوپۆ؛ لکوپۆ؛ لقوپەل؛ لەقوپۆ؛ لکوپەل؛ پەلوپۆ؛ چڵوویل: ۱. پژوپۆ؛ جقوبەڵگ؛ سەرجەمی چڵوپۆی گیایەک ‹شاخ و برگ درخت جلو پنجره را گرفته بود: لەقوپۆپی دارەکە بەر دەلاقەکەی گرتبوو› ۲. *[مجازی]* ڕاڤەکاری زێدە لە وتاردا ‹خیلی به داستانش شاخ و برگ داده بود: زۆر لقوپۆی بە چیرۆکەکەی دابوو›.

**شاخه** / šāxe ، ـها/:اسم. ۱. شاخە؛ لق؛ پەل؛ پەلک؛ لپ؛ لک؛ لکە؛ لەژگ؛ قیت؛ تا؛ چڵۆک؛ چڵ؛ شات؛ بەشێک لە لاسکی دار، دەوەن یان پنجکەگیا کە وەک ساقەتەیەکی بچووکتر لێوە سەرهەڵدا ‹یکی از شاخەهای درخت توت رفته بود خانەی همسایه: لقێک لە دارتووەکە چووبووە نێو ماڵی دراوسێکەوە› ۲. لق؛ شاخە؛ پەل؛ بەشێک لە کۆمەڵێکی بەربڵاوتر: *الف)* کە باپیرانیان یەکێکە ‹شاخەای از کُردهای کرمانجی را به قوچان کوچ دادند: لقێک لە کوردە کرمانجیەکانیان بەرەو قووچان تاراند› *ب)* دەستە زمانگەلێ کە بە بۆنەی وێکچوونی وشەکانیان لەگەڵ زمانێکدا، پێکەوە هاو ڕەگەزن ‹زبانهای ایرانی شاخەای از زبانهای

هندو-ایرانی هستند: زمانگەلی ئیرانی لقیک لە زمانە هیندوو-ئێرانیەکانن› ج) بەشێک لە زانیاری کە بکرێت لە بەستێنگەلی پێوەندیداری تر جویَ بکرێتەوە ‹خون شناسی شاخەای از علم پزشکی است: خوێنناسی شاخەیەک لە زانستی بژیشکیە› د) بەشێ لە رێخراوەیەک ‹شاخەی آموزشی وزارت نفت: پەلی فێرکاری وەزارەتی نەوت› هـ) باریکەیێ کە لە جادە، ڕووبار یان زێبارێک جویَ دەبێتەوە ‹شاخەای از آب سیروان: لقێک لە ئاوی سیروان› و) بەشێک لە چلچرا کە گلۆپێکی پێوە هەڵدەواسرێ ٣. *[زیست‌شناسی]* لق؛ شاخە؛ پەل؛ لە دابەشکراوەگەلی گیانەوەری و گیایی؛ بەشێک لە زنجیرەیێ کە خۆی دەبێتە چەند ریز ‹شاخەی پرندگان: لقی پەلەوەران›.

◘ **شاخەی گل:** لقی/چلی/ پەلکی گوڵ؛ پەلی چکۆلەی گیایەکی گوڵدار کە گوڵی پێوە بێ ‹چند شاخەی گل آورد و توی گلدان گذاشت: چەند لەق گوڵی هێنا و خستیە نێو گوڵدانەوە›.

**شاخەای** / šāxe'î/: *قید.* ١. لقێک؛ لەقێک؛ چلێک؛ چلێو؛ پەلیَ؛ لەقێو ‹شاخەای صد تومان می‌فروخت: لقیکی بە سەد تمەن دەفرۆشت› ٢. چلی؛ پەلی؛ بە چلی؛ بەپێی لق ‹شاخەای حساب می‌کنند: چلی حیسابی دەکەن›.

**شاخەــ شاخە** / šāxešāxe/: *صفت.* لق‌ــلق؛ لەق‌ــلەق؛ پەل‌ــپەل؛ چڵ‌ــچڵ؛ زۆر لق و پەلدار ‹رودخانە در آن نقطە شاخەــشاخە می‌شود: چۆم لەو شوێنەدا لق ــ لق دەبێتەوە›. هەروەها: **شاخە‌ شاخە شدن؛ شاخەــ شاخە کردن**

**شاخەنبات** / šāxenabāt ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* شاخەنەوات؛ تیکەنەواتێ کە بە شێوەی لق دروست کراوە.

**شاخی** / šāxî/: *صفت.* شاخین؛ قۆچی؛ لە ماکی کراتین، واتا ماکی پێکهێنەری قۆچ ‹مادەی شاخی: ماکی شاخین›.

◘ **شاخی شدن:** ڕەقینە بەستن؛ ڕەقیڵە بەستن؛ شەقار- وەقار بیەی؛ ڕەق هەڵگەڕان و وەک ماکی شاخی لێهاتنی بەشێک لە سەرپێستی گیانداران ‹پاشنەهایش پینە بستە و شاخی شدە بود: پاژنەکانی ببوونە پینە و ڕەقینەیان بەستبوو›.

**شاد** / šād/: *صفت.* شاد؛ شاو؛ شای: ١. گەوز؛ بەکەیف؛دەماخ‌چاخ؛ دڵڕوون ‹همە شاد شدند: هەموو شاد بوونەوە› ٢. شادی هێنەر ‹روز شاد: ڕۆژی شاد›. هەروەها: **شاد بودن؛ شاد شدن؛ شاد کردن**

**شاداب** / šādāb/: *صفت.* پەژ؛ سەرحاڵ؛ گەش؛ گەوش؛ گەوز؛ نازاڤ؛ تەڕوبەڕ؛ تەڕوتول؛ گەش‌وشلک؛ تەرچک؛ بسکوڕی؛ هەڤیاری شادی ‹چهرەی شاداب؛ گل شاداب: ڕوخساری پەژ؛ گولی گەش›.

**شادابی** / šādābî/: *اسم.* پەژی؛ گەشی؛ گەوشی؛ بەگەشەیی؛ بەنەشەیی؛ لە گەشەیی؛ تەرچکی؛ تەڕوبەڕی؛ گوڵ‌بەدەمی؛ تێراوی؛ سەرحاڵی؛ نازاڤی.

**شادان** / šādān/: *قید.* شادان؛ بە شادیەوە؛ بە کەیفخۆشیەوە؛ بە دڵخۆشیەوە ‹شادان و خندان بە خانە بازگشت: شادان و دەم بە پێکەنین گەڕایەوە بۆ ماڵ›.

**شادباش** / šādbāš ، ـها/: *اسم.* پیرۆزبایی؛ شاگا؛ شەگە؛ شابە؛ شاواش؛ شاوانی؛ شۆباش؛ شاباش؛ وتەیەک بە نیشانەی بەشداری لە شادی یان دڵخۆش‌بوون لە سەرکەوتنی کەسێک پێی دەگوترێ یان بۆی دەنووسرێ ‹حاضران در مجلس بە عروس و داماد شادباش گفتند: ئامادە بوان لە کۆڕەکە پیرۆزباییان لە بووک و زاوا کرد›.

**شادخواری** / šādxārî ، ـها/: *اسم. [ادبی]* کاری مەی خواردنەوە هاوڕێ دەگەڵ کەیف و خۆشیدا. هەروەها: **شادخوار**

**شادروان** / šādorvān/: *اسم. [قدیمی]*

۱. ڕەشماڵ؛ خێوەت؛ هۆبە؛ تاوڵ؛ چادرە؛ سیاماڵ ۲. سابات؛ ساوات؛ سەیوان؛ کەپر ۳. بەربەند؛ ئاوگر.

**شادروان** / šādravān ، ـان/: *صفت.* خوالێخۆشبوو؛ ڕەوانشاد؛ خاوەن ڕەوانی شاد بە بۆنەی چاکەکاری لە درێژایی ژیاندا (ڕێزناوی مردووان).

**شادکام** / šādkām ، ـان/: *صفت. [ادبی]* کەیفخۆش؛ بەهرەوەر لە شادی و خۆشی بە هۆی کامەرانیەوە ‹دلم شد به دیدار تو شادکام: کەیفخۆش بووم بە دیداری تۆ›.

**شادکامی** / šādkāmî ، ـها/: *اسم.* کەیفخۆشی؛ کامەرانی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شاد و دڵخۆش بوون.

**شادمان** / šād(e)mān/: *صفت. [ادبی]* شاگەشکە؛ شادمان؛ شادومان؛ دڵخۆش؛ شاد؛ شا؛ کەیفخۆش؛ بەهرەوەر لە شادی، بەتایبەت شادی گەورە و درێژخایەن ‹از شنیدن این خبر شادمان شد: لە بیستنی ئەم هەواڵە شاگەشکە بوو›.

**شادمانه** / šādmāne/: *قید. [ادبی]* بە شادمانیەوە؛ شادمانانە؛ بە شادیەوە؛ بە دڵخۆشیەوە ‹شادمانه می‌خندیدند: بە شادمانیەوە پێدەکەنین›.

**شادمانی** / šād(e)mānî ، ـها/: *اسم.* شاگەشکەیی؛ شادمانی؛ شادومانی؛ خۆشی زۆر؛ شابوویی؛ شادانی؛ شاهینە؛ دۆخ یان چۆنیەتی شاد بوون، بەتایبەت بەهرەمەند بوون لە شادی گەورە و درێژخایەن.

**شادی** / šādî ، ـها/: *اسم.* خۆشیان؛ شادی؛ شایی؛ سۆز؛ تووک؛ بەدەماغی؛ خۆشی؛ خۆشی-خۆشی؛ گەشە؛ شەوق؛ ڕەوەت؛ بەکەیفی؛ هەون؛ تەڕدەماخی؛ کەیف سازی؛ کەیف خۆشی؛ باری دەروونی کە لە سەرکەوتوویی، بەختەوەری یان هەبوونی شتێکی دڵخوازەوە سەرچاوە دەگرێ ‹از شادی سر از پا نمی‌شناختم: لە خۆشیاندا پام زەوی نەدەگرت›.

▣ **شادی کردن**: شادی کردن؛ شایی کردن؛ خۆشی کردن؛ وەشی کەردەی؛ کەیف کردن؛ دەربڕینی خۆشحاڵی و شادی خۆ ‹همه می‌خواندند، می‌رقصیدند و شادی می‌کردند: هەموو دەیانخوێند و هەڵدەپەڕین و شادیان دەکرد›.

**شادی‌آور** / šādîyāvar, šādî'āvar/: *صفت.* دلڤەکەری؛ دڵخۆشکەر؛ شادیهێن؛ بەدیهێنەری شادی.

**شادیانه** /šādiyāne/: *اسم. [نامتداول]* شایانە؛ خۆشی؛ چەپڵەڕێزان؛ شایلۆغان؛ کارێ کە بە نیشانەی دەربڕینی خۆشحاڵی لە ڕووداوێک، ئەنجام دەدرێت (وەکوو دیاری‌دان بە کەسێک یان ڕێکخستنی جەژن و میوانی).

**شادیبخش** / šādîbaxš/: *صفت.* دڵخۆشکەر؛ شادی‌بەخش؛ شادیهێن؛ دلگوشا؛ شادیهێنەر؛ هۆی شایی ‹خبر شادی‌بخش: هەواڵی شادیهێنەر›.

**شاذ** / šāz(z)/: [عربی] *صفت. [ادبی]* دەگمەن؛ نایاب.

**شارب** / šāreb ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* سمێڵ؛ سوێڵ؛ سیوڵ.

**شاربن** / šārbon/: [فرانسوی] *اسم. [پزشکی]* ڕەشەبرین؛ ڕەشەزام؛ سیازام.

**شارت‌وشورت** / šārt-o-šûrt/: *اسم. [تعریض]* هەڕەشە وگوڕەشە؛ شاتەشات؛ قەپوقاڵ؛ هەرا و هەڕەشە؛ گەف‌وگوڕ؛ شات‌وشووت؛ هارت‌وپۆرت؛ قاڵ‌وقوو: **زارت‌وزورت**

**شارح** / šāreh ، ـان/: [عربی] *اسم.* لێکۆڵەر؛ ڕاڤەکار؛ کەسێ کە واتا شی دەکاتەوە یان لە سەر کتێبێک ڕاڤە دەنووسێ ‹او شارح اصول اقلیدس بوده است: ئەو لیکولەری بنەماگەلی ئوقلیدوس بووە›.

**شارژ** / šārj/: [فرانسوی] *اسم.* گەش: ۱. چەندێتی

کارەبـــا، بەتایبـــەت کـــەمی یـــان زۆری ئیلیکترونەکان لـە شـتێکدا ۲. کـار یـان ڕەوتی گەشانەوە؛ گەشاندنەوە؛ کار و بـاری پڕکردنـەوە ‹شارژ گاز فندک؛ شـارژ بـاتری موبایـل: گەشـانەوەی گـازی فەنـدەک؛ گەشـاندنەوەی بـاتری موبایـل› ۳. ☜ **چارجینگ**

▣ **شـــارژ شـــدن**: گەشـــانەوە: ۱. گـــەش بوونـەوە؛ گەشـەوە بـوون لـەبـەر وەرگـرتن و هەڵـگرتنی شـتێک بـە پێچەوانـەی بـەتـاڵ بوونـــــەوەی ۲. *[مجـــازی]* بووژانـــــەوە؛ ژووژانـــەوە؛ ژووژیانـــەوە. هـــەروەها: **شـــارژ کردن**

**شـــارع** / 'šāre ، ـهـا/: [عربـی]*اسـم*. ۱. *[ادبـی]* /شـوارع/ شـــەقام؛ ڕەواز؛ ڕێبـــاز؛ بوارگـــە؛ ڕێگـــا؛ ڕێ ۲. /ـــان/ دینـــــاوەر؛ داهێنـــــەر یـــان دامەزرێنەری شەریعەت.

▣ **شارع عام**: شەقام؛ ڕەواز؛ ڕێباز؛ بواری گشتی؛ ڕێگایەک کە بۆ هەموان دەبێت.

**شارلاتان** / šārlātān ، ـهـا/: [فرانسوی از ایتالیـایی] *صفت*. شارلاتان؛ فێڵباز؛ یارمباز؛ شڵتاغ؛ کەڵەش؛ قولتەشـــە؛ ســاختەچی؛ هەڵەمتـــەچی؛ ســووتار؛ تـــەوەل؛ چەقاوەســـوو؛ گـــەڕفرۆش؛ شـــەللاتی؛ قەلاش؛ سنۆتە؛ گزیکار؛ فریوکار.

**شـــارمند** / šārmand ، ـان/: *اسـم*. هـــاوولاتی؛ هاوشاری.

**شاره** / šāre/: *اسم. [فیزیـک]* ڕەوان؛ هـەرکام لـەو ماکانەی کە بەخورن و بە بیچمی دەفر دەردێـن (وەک تراو و گاز).

**شـــاریدن** / šārîdan/: مـــصدر. *لازم. [فیزیـــک]* ڕاخوشـــین؛ خـــوڕە کـــردن؛ شـــۆڕەکردن؛ ڕەوان بـــوون؛ خوشـــەی؛ کێـــژین؛ شـــیان؛ بـــەر بـــوون: **شُریدن** *[گفتاری]*

■ صفت فاعلی: **شارنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **شاریده** (ڕاخوشیو)

**شـــازده** / šāzde ، ـهـا/: *اسـم. [مخفـف، گفتـاری]* شازادە؛ شاهزادە؛ شازا.

**شاسترسون** / šāstersûn/: [؟] ☜ بهمنی سرخ، **بهمنی**

**شاسی** / šās(s)î ، ـها/: [فرانسوی]*اسم*. ۱. شاسـی؛ چوارچێـــوەی ژێـــرینی ماشـــین کـــە هـــۆدە و بەشەکانی دیکەی لـە سـەر سـوارە ۲. دوگمـە؛ کلیل؛ پشکۆژ؛ کلیلێ کە بە ئەنگوست گوشـاری دەدەن تا دەزگایێ بکەوێتە کار ۳. ژێـردەسـتی؛ ژێردەسی.

**شـاش** / šāš/: *اسم. [گفتاری]* میـز؛ مێـز؛ گمێـز؛ گمیز؛ زاراو؛ پێشاو؛ شاش؛ ڤۆک.

▣ **شاش بزرگ**: *[مجـازی]* **عەعـەی ڕەش؛ عـەعا**؛ کارگەورە ‹شـاش بـزرگ کـرده: عەعـەی ڕەشـی کردووە›.

**شاش خالی/کوچک**: میز؛ مێز؛ گمێز؛ مێزکاڵ؛ مێزتەڕە؛ کاربووچک.

▣ **شاش کردن**: میزتن؛ مێزتن؛ میزیان؛ مێزیان؛ میزان؛ میستن؛ میز/ مێزکردن؛ گمێز کـردن/ کەردەی.

**شاش کسی کف کردن**: *[تعـریض]* ئاو لە گونانی کەسێک گەڕان: ۱. گمێـزی کەسـێک کـەف کردن؛ مەیلی کەسێک جمین ۲. پێگەیشتن؛ باڵغ بوون؛ پەرفین؛ چوونە سـەر دیـوار ‹تـازە شاشش کف کرده بود: تازە پێگەیشتبوو›.

**شـاش کـسی گـرفتن**: بـۆ کەسـێ میزهـاتن؛ مێزهاتن؛ گمێزئامەی/ ئامای ‹بد وقتـی شاشـش گرفته بود: ناوەخت میزی دەهات›.

**شاشـبند** / šāšband/: *اسـم. [پزشـکی]* شاشـبەن؛ چورکـــەپـــێچ؛ دۆخ یـــا دیـــاردەی میـــزگیران؛ مێزگیران؛ گمێزگیریەی؛ پێشاو قـەتیس بـوون؛ دیاردەی کۆوە بوونی میز لە میزەڵـدان و خاڵـی نەبوونی بەهۆی ئازاری دەماری، چیامـانی، و...: **حبس بول**

**شاشو** / šāšû ، ـها/: *صفت. [گفتـاری]* ۱. دەڵـەمیز؛ دەڵەمێز؛ دڵـەگمێز؛ مێـزەک؛ گمێـزن؛ مێـزن؛

مێــزەڵ؛ کــەلمیز؛ گەڵــمێز؛ گەڵــەگمێز؛ گمێزەنەکەر؛ بە کردەوە یا خووی میز بـە خـۆدا کـردن ۲. *[کنایی]* حیـزەڵ؛ حیزەڵـە؛ حیـزی حیزان؛ ترسەنۆک ‹پسرەی شاشو تا آنها را دید بە گریە و التماس افتاد: کوڕە حیـزەڵ تـا چـاوی پێیـان کەوت کەوتە گریان و پاڕانەوە›.

**شاشیدن** / šāšîdan /: *مصدر. لازم.* // **شاشـیدی:** میزیـای؛ **مـیشاشـی:** دەمیـزی؛ **بـشاش:** بمیـزە// *[گفتاری]* میزتن؛ میزیان؛ مێزیان؛ میزان؛ میستن؛ شاشین؛ چـورەن؛ میزکـردن؛ مێزکـردن؛ گمێـز کردن؛ میز دەردان.

■ صفت مفعولی: **شاشـیده** (میـزاو)/ مـصدر منفـی: **نشاشیدن** (نەمیزتن)

**شـاطر** / šāter ، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم.* شـاتر؛ نان‌کەر؛ نانەوا؛ نان‌پێژ؛ نان‌برێژ؛ نانەپەچ؛ کەسـێ کە ئەنگوتک بە تەنوورەوە دەدا.

**شاعر** / šā'er ، ـها؛ ـان؛ شعرا/: [عربی]/*اسم.* هەستیار؛ شاعیر؛ شاعیرە؛ شایەر؛ هەڵبەستوان؛ هۆزانـڤان؛ هۆنـەر؛ بـەیت‌بـووش؛ کەسـێ کـە هەڵبەسـت دەهۆنێتەوە.

**شـاعرانه**[1] / šā'erāne/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت.* هەسـتیارانە؛ شـاعیرانە: ۱. هۆنراوانـە؛ بـە تایبەتمەنـدی شـیعرەوە، بەتایبـەت خـاوەن چۆنیەتی هەستیاری یـان هانـدەری هەسـتەوە ‹روحیـەی شـاعرانە: ورەی شـاعیرانە› ۲. وەکـوو شاعیران ‹رفتار شاعرانە: ئاکاری هەستیارانە›.

**شاعرانه**[2]: *قید.* شـاعیرانە؛ بـە شـێوە و شـێوازی شاعیران ‹خیلی شاعرانە حرف مـی‌زد: زۆر شـاعیرانە قسەی دەکرد›.

**شـاعره** / šā'ere ، ـهـا/: [عربـی]/*اسـم.* هەسـتیار؛ شاعیر؛ ژن یان کچێ کە شیعر دەڵێ.

**شاعری** / šā'erî/: [عربی]/*اسم.* شـاعیری: ۱. بـار یـان چۆنیـەتی شـاعیر بـوون ‹از شـاعری نـان در مـی‌آورد: لـە ڕێـی شـاعیریەوە نـانی دەردێنـێ› ۲. هونەری شیعر گوتن ‹کارش شاعری است: کار و باری شاعیریە›.

**شـاغل** / šāqel ، ـهـا؛ ـان؛ ـیـن/: [عربـی] *صـفت.* کارمەند؛ لەسەر کار ‹در وزارت دارایی شاغل است: لە وەزارەتی داراییدا کارمەندە›.

▣ **شاغل بودن:** کارمەند بـوون؛ بـە ئـیش بـوون ‹سە سال پیش شاغل بود: سـێ سـاڵ لەمـە پـێش کارمەند بوو›.

**شاغل شدن:** دامەزران؛ دامەرزیان؛ چوونە سەر کار ‹سە سال پیش شاغل شد: سێ ساڵ لەمە پێش دامەزرا›.

**شـاغول** / šāqûl ، ـهـا/: *اسـم.* شـاوڵ؛ شـاقووڵ؛ ئامێرێک بۆ هەڵـسەنگاندنی تـرازی ئەسـتوونی بریتی لە بەنێک کە کانزایەکی خڕ و نووک‌تیژی پێوە هەڵواسراوە: **شاقول**

**شاف** / šāf ، ـها/: [از عربی]/*اسم.* *[گفتـاری]* شـاف؛ شیاف.

**شـافت** / šāft ، ـهـا/: [فرانـسوی]/*اسـم.* شـافت؛ شـەفت؛ قـورم؛ شـڤک؛ دەسـتک؛ شـڤاک؛ میلەیـەک کـە پـوولی، چـەرخ دەنـدە یـان بولبرینگی لە سەر دادەنـرێ و جووڵـە و خـولی ماشێن لە بەشێکەوە دەداتە بەشێکی‌تر: **شفت**

**شافعی**[1] / šāfe'î/: [عربی]/*اسم.* شـافیعی؛ شـافعی؛ یەکێک لە چوار ڕێبازی بەناوبانگی موسوڵمانانی سوننی، کە ئیمـام شـافیعی موحەمـەد، کـوڕی ئیـــدریس (۱۵۰-۲۰٤ ک.م.) و خوێنـــدکارانی دایانمەزراند.

**شـافعی**[2] / ـهـا؛ ـان/: *صـفت.* شـافیعی؛ شـافعی؛ شوێنکەوتەی ئایینی شافیعی ‹فقیه شافعی: زانـای شافیعی›.

**شاق** / šāq(q)/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* دژوار؛ گـران؛ ئاریـشە؛ سەخـڵەت؛ ڕژد ‹عمـل شـاق: کـردەوەی دژوار›.

**شاقول** / šāqûl/ ☜ **شاغول**

**شـاکر** / šāker ، ـان؛ ـیـن/: [عربـی] *صـفت.* *[ادبـی]* شوکرانەبژێر؛ شوکرانەبێژ؛ سپاس‌وێژ؛ پێزان ‹مـن

از بخت خودم شاکرم: من له بەختی خۆم شوکرانەبژێرم›.

**شاکی** [1] / šākî ، ـها؛ ـان؛ شُکات/: [عربی]/اسم. دادبەر؛ سکاڵابەر؛ گلەکار؛ گازنکار؛ گلیکەر؛ شکاتکەر؛ ئەو کەسە کە سکاڵای خۆی دەباتە لای دادوەر ‹از شاکی خواسته شد، موضوع شکایتش را اظهار کند: لە دادبەر داواکرا بابەتی سکاڵاکەی دەربڕێ›.

**شاکی** [2] / ـها؛ ـان/: صفت. [گفتاری] گلەمەند؛ گلەمەن؛ ناڕازی؛ نارەزا؛ تووڕە و تێکهەڵچوو ‹آزاد از دستت شاکی است: ئازاد لە دەستت گلەمەندە›.

**شاگرد** / šāgerd ، ـها؛ ـان/: اسم. شاگرد: ۱. قوتابی؛ قوتە؛ قتاو؛ قوتاب؛ کەسێ کە خەریکی فێربوونی زانست یان کارێکە ‹شاگرد مدرسە؛ شاگرد مکانیک: قوتابی فێرگە؛ شاگردی میکانیک› ۲. بەردەست؛ وەردەس؛ کرێکاری نێو دوکان، بەتایبەت کارگەی چکۆلە ‹شاگرد سلمانی؛ شاگرد نجاری: شاگردی سەلمانی؛ بەردەستی چێوتاش›.

**شاگردانگی** / šāgerdānegî/ ☜ **شاگردانە**

**شاگردانە** / šāgerdāne ، ـها/: اسم. شاگردانە؛ دەسخۆشانە؛ نەودارە؛ دیاری یان پارەیێ کە وەک دەسخۆشی بە کرێکاری نێو دووکان دەدرێت ‹شاگردانەی بچەها فراموش نشود؛ این صد تومان هم شاگردانەی شما: دەسخوشانەی منداڵەکانت لە بیر نەچێ؛ ئەم سەد تمەنەش شاگردانەی ئێوە›: **شاگردانگی**

**شاگردی** / šāgerdî/: اسم. شاگردی؛ بەردەستی؛ کار یان ڕەوتی شاگرد بوون ‹مدتی پیش عمویم شاگردی کردم: ماوەیەکیش لای مامم شاگردیم کرد›.

**شال** / šāl/: اسم. شاڵ: ۱. شاشک؛ شوتیک؛ شویتک؛ شیتک؛ موندی؛ بووزوو؛ جۆرێک قوماشی پەشمی دەسچن و نەرمە ۲. ـها/ چەپەربەن؛ ملپێچ؛ تیکە پارچەیەکی پەشمی یان دەسچنی ساکار یان گوڵدارە کە لە سەرما بۆ داپۆشانی سەر و مل بە کار دەڕوا ۳. ـها/ مێرا؛ موندی؛ مێمن؛ پشتێند؛ پشتوێن؛ پشتێن؛ بیبن؛ پارچەیێ کە بە دەوری کەمەرەوە دەبەسترێ. هەروەها: **شالگردن؛ شالکمر**

▣ **شال و کلاه کردن**: [مجازی] خۆ پێچاندنەوە؛ خۆ گورجەو کردن؛ خۆ تەیار کردن بۆ ڕۆیشتن ‹باز کجا شال و کلاه کردەای؟: هەمیسان بۆ کوێ خۆت پێچاوەتەوە؟›: **کفش و کلاه کردن**

**شالاپشلوپ** / šālāpšŭlûp, -šolûp/ ☜ **شلپشلوپ**

**شالپستانە** / šālpestāne/ ☜ **سنجد تلخ-۲**

**شال زیتون** / šālzeytûn/: [فارسی/ عربی] ☜ **سنجد تلخ-۲**

**شالسنجد** / šālsenced/ ☜ **سنجد تلخ-۲**

**شالک** / šālak/ ☜ **تبریزی**

**شالنگ** / šālang ، ـها/: اسم. گلێمە؛ پەلاس؛ ژێرفەرشی؛ ڕایەخێ کە دەخرێتە ژێر قالیەوە.

**شالودە** / šālûde ، ـها/: اسم. بنەڕەت؛ بنیات؛ بنەما؛ بنچینە؛ بناخە؛ بناغە؛ شەنگستە؛ خیم؛ هیم: ۱. سۆکین؛ ڕستی؛ بنەڕەتی سروشتی یان دەسکرد بۆ لەسەر دانانی خانووبەرە ‹شالودەی پل هنوز سالم است: بنەڕەتی پردەکە هێشتا هەر ساغە› ۲. پێز؛ تین؛ شیشک؛ هێم؛ بنڕەخ؛ قانگە؛ سەرجەمی کار و هەموو بەراوردێک بۆ دەسپێکردنی کارێک ‹شالودەی این کار غلط بودە است: بنەڕەتی ئەم کارە هەڵە بووە›.

**شالی** / šālî ، ـها/: اسم. چەڵتووک؛ پشکیک؛ پوشیک؛ پیشک؛ پادینگ؛ برنجی نەکوتراو.

**شالیزار** / šālîzār ، ـها/: اسم. چەڵتووکجاڕ؛ مەرەزە؛ قەرە؛ برنجەجاڕ؛ برنجاڕ؛ گرنجاڕ؛ کێڵگەی برنج.

**شالیکار** / šālîkār ، ـها؛ ـان/: اسم. برنجچێن؛

برنج کێڵ؛ جۆدانە؛ جۆدان؛ جەوان؛ گۆخڵ؛ مەرەزەوان؛ وەرزێرێ کە برنج دەچێنێ.

**شالیکاری** / šālîkārî/: *اسم.* ١. جەوانی؛ کار یان ڕەوتی برنج چاندن؛ برنج وەشاندن ٢. ـها/ *[گفتاری]* برنجار؛ چەڵتووکجاڕ؛ برنجەجاڕ؛ گرنجاڕ؛ مەزرای برنج ‹همه‌ی این زمینها تا سه سال پیش شالیکاری بود: تەواو ئەم زەوینانە تا سێ ساڵی پێش چەڵتووکجاڕ بوو›.

**شالیکوبی** / šālîkûbî/: *اسم.* ١. کار و ڕەوتی برنج‌کوتان؛ چەڵتووک کردنەوە؛ کوتاندنی لقی برنج بۆ جوێ‌کردنەوەی دانەی برنج لە پێستەکەی ٢. ـها/ شوێنی برنج کوتان.

**شام** / šām/: *اسم.* ١. شێو؛ شوم؛ شووم؛ بەرشێو؛ بەرشێڤ؛ شێڤ؛ شووڤ؛ وێرەگانە؛ چاشنەشەو؛ چاشنەشام؛ چێشتی شەوانە ‹شام خوردیم و خوابیدیم: شێومان خوارد و خەوتین› ٢. *[ادبی]* ئێواران؛ ئێوارە؛ سەرئێوارە؛ وێرەگا؛ سەرەتای شەو؛ سەرشەو ‹صبح و شام در خدمت او بود: بەیانی و ئێواران لە خزمەتی ئەودا بوو›.

**شامپانزه** / šāmpānze ، ـها/: [از فرانسوی] *اسم.* شامپانزە؛ گیاندارێکی گواندارە کە بە دارەوە دەژی و وەک مرۆ دەنوێنێ، لەشی لە گوریل بچووکتر و لاوازتر و گوێی گەورەترە: **شمپانزه**

**شامپانی** / šāmpāny/: [فرانسوی] *اسم.* شامپانی؛ شامپاین؛ جۆرە شەراوێکی کەفاوی گازدار و سپیە: **شامپاین**

**شامپاین** / šāpāyn/: [فرانسوی] ☜ **شامپانی**

**شامپو** / šāmpo, šāmpû ، ـها/: [انگلیسی از هندی] *اسم.* شامپۆ: ١. سابوونی تراو، بەتایبەت ئەوی بۆ شۆردنی سەر بە کار دێ ٢. پێشۆرێ تراو بۆ شت‌وشۆی مووکیت، قاڵی و موبل.

**شآمت** / še'āmat, ša'āmat/: [عربی] ☜ **شئامت**

**شامخ** / šāmex/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* بەرز؛ بڵند؛ بڵیند؛ هەڵکەوتە؛ هەڵکەوتوو ‹مقام شامخ: پلەوپایەی بەرز›.

**شامگاه** / šāmgāh/: *اسم.* *[ادبی]* چراکەران؛ بانگاڤ؛ تاریکان؛ تاریکەی؛ درەنگان؛ سەرشەو؛ دوای ئێوارە؛ بوومەلێڵ؛ بوولێڵە؛ شێوانگا؛ وەختی شێوان؛ دەمی چرا هەڵکردن؛ کاتی شەو؛ لە سەرەتای تاریک بوونی هەوا تا کاتژمێرێکی دواتر ‹هر شامگاه درمیانه‌ی میدان صف می‌بستند: چراکەران لە ناو گۆڕەپاندا ڕیزیان دەبەست›.

**شامگاهان** / šāmgāhān/: *قید.* *[ادبی]* چراکەران؛ بانگاڤان؛ کاتی چراکەران؛ سەرشەو.

**شامگاهی** / šāmgāhî/: *صفت.* شێوانگایی؛ بانگاڤی؛ پێوەندیدار یان سەر بە چراکرانەوە ‹برنامه‌ی شامگاهی: بەرنامەی شێوانگایی›.

**شامل** / šāmel/: [عربی] *صفت.* بریتی؛ بریتی؛ بریەتی؛ داگر؛ لەخۆگر؛ بەرخۆدەر ‹این کتاب شامل واژه‌های امروزی است: ئەم کتێبە بریتیە لە وشەی ئەوڕۆکە›.

▣ **شامل بودن**: بریتی بوون؛ لە بەرگرتن؛ دڤەر گرتن ‹این برنامه شامل سه بخش است: ئەم بەرنامە بریتیە لە سێ بەش›. هەروەها: **شامل شدن**

**شامورتی** / šāmvûrtî, šāmûrtî, šāmortî/: [ارمنی] *اسم.* کەلوپەلی چاوبەستی؛ کەرەسەگەلێ کە کارگەلی سەیر و سەمەرەی پێدەکەن.

**شامورتی‌بازی** / šāmvûrtîbāzî, šāmûrtî-, šāmortî- ، ـها/: [ارمنی/ فارسی] *اسم.* *[تعریض]* جانقولی‌بازی؛ چاوبەستی ‹این شامورتی‌بازیها برای چیست؟: ئەم جانقولی‌بازیانە بۆ چیە؟›.

**شامه** / šāme ، ـها/: *اسم.* پەردە؛ دەرسووک؛ کاژ؛ کاش: ١. *[زیست‌شناسی]* پەردەیەکی ناسک و ڕوون کە سیتوپلاسمی خانگەلی گیایی و گیانەوەری دادەگرێ ٢. *[کالبدشناسی]* کاژێ؛ پەردەیەکی ناسک، کە ئەندامانی هەناو (وەک سی، دل، گورچیلە و...) دادەپۆشێ.

**شامه** / šāmme/: [عربی] *اسم.* ١. بۆیایی؛ هەستی

بۆزەنی؛ بۆن هەست پێکردن ‹حس شامه: هەستی بۆیایی› ٢. ئەندامی بۆن‌کردن.

**شامی** / šāmî ، ـها/: اسم. شامی‌کەباب؛ شانی‌کەباب؛ شامی‌کەواو؛ شفتە؛ کفتە؛ کفتەناوتاوەیی؛ جۆرێ کەبابە لە قیمە و ئاردی نۆکە قەنی کە لە ناو ڕۆندا سوور دەکرێتەوە.

**شان** / šān/ ١. ☜ **شانه ـ٦** ٢. ☜ شانەی عسل، **شانه**

**ـ شان** / ešān ، ـها/: ضمیر. ـ یان: ١. ـ شا؛ جێناوی خاوەنیەتی لکاو بۆ سێهەم کەسی کۆ ‹دستشان؛ پایشان: دەستیان؛ پایان› ٢. ـ ن؛ ـی؛ جێناوی بەرکاری لکاو بۆ سێهەم کەسی کۆ ‹بردشان به خانه: بردیانی/ بردنی بۆ ماڵەوە›.

**شأن** / ša'n ، ـها؛ شئون/: اعربی]/سم. شان؛ پێگە؛ پلە و پایە.

▣ **در شأن کسی**: لەبارەی کەسێکەوە؛ سەبارەت بە کەسێک؛ لە مەڕ کەسێکەوە ‹این آیه در شأن او نازل شد: ئەم ئایەتە لەبارەی ئەوەوە هاتووەتە خوارەوە›. هەروەها: **در شأن چیزی**

▣ **در شأن کسی نبودن**: شیاوی کەسێک نەبوون؛ هێژای کەسێک نەبوون؛ لە شانی کەسێکدا نەبوون ‹این کار در شأن او نیست: ئەم کارە شیاوی ئەو نیە›.

**شانتاژ** / šāntāj ، ـها/: [فرانسوی]/سم. شەڕ و گەڕ؛ کار یا ڕەوتی هەوڵ دان بۆ بەزاندنی لایەنی نەیار لە ڕێگەی سەفسەتە، ترۆ کردن، هەڵخڕاندنی بیسەران و بەرگری لە قسەکردن یان کاریگەر بوونی قسەی لایەنی نەیار ‹او خوب بلد است شانتاژ کند و حرفش را پیش ببرد: ئەو چاک دەزانێ شەڕ و گەڕ بکا و قسەی بباتە بەرەوە›.

**شانزده**[١] / šānzdah/: اسم. شازدە؛ شانزە؛ شانزدە؛ ژمارەی سەرەکی دوای پازدە و پێش حەڤدە.

**شانزده**[٢]: صفت. شانزە؛ شانزدە: ١. دانەیەک زۆرتر لە پازدە ٢. شانزدەیەم؛ شازدەهەم.

**شانزدهم** / šānzdahom/: صفت. شازدەهەم؛ شانزەیەم.

**شانزدهمی** / šānzdahomî/: ضمیر. شازدەهەمی؛ شانزەیەمی؛ شازدەمی؛ ئەوەی کە لە ڕیز، پێگە یان جێگەی شازدەهەمدا بێ.

**شانزدهمین** / šānzdahomîn/: صفت. شازدەهەمین؛ شازدەمین؛ شازدەهەم؛ شازدەیەم.

**شانس** / šāns ، ـها/: [فرانسوی]/سم. بەخت؛ بەختە؛ ناوچاو؛ شانس؛ تاڵە؛ فیشکە؛ ڕەشنە؛ ڕووچە؛ هات؛ هات‌وبات؛ فریشتە؛ ‹شانس به تو روی آورده، استفاده کن؛ خدا شانس بدهد: بەخت ڕووی تێکردووی، کەڵکی لێوەرگرە؛ خودا بەخت بدا›.

▣ **شانس آوردن**: بەخت هێنان؛ پێوە هاتن؛ شانس بوون؛ شانس هێنان؛ بەخت یار بوون؛ هەلی چاک بۆ کەسێک هەڵکەوتن ‹شانس آوردم کسی آنجا نبود مرا ببیند: بەختم هێنای کەسێک لەوێ نەبوو بمبینێت›.

**شانس به کسی رو آوردن**: بەخت/ شانس ڕوو کردنە کەسێک؛ شانس بە دەم کەسێکەوە هاتن؛ بەخت/ شانس گرتن؛ بەخت لە کەسێ یار بوون؛ بەخت بۆ کەسێک پەڕژان؛ کەوتنە بەختەوەریەوە ‹شانس به او روی آورد و کار خوبی پیدا کرد: بەخت ڕووی تێکرد و کارێکی چاکی دۆزییەوە›.

**شانس داشتن**: بەخت‌یار بوون؛ شانس هەبوون ‹این جور وقتها سارا خیلی شانس دارد: کاتی وا سارا زۆر بەختی‌یارە›.

**شانس کسی گفتن**: [گفتاری] بەخت ڕوو لە کەسێ کردن/ هێنان؛ بەختی کەسێک یار بوون؛ لەگەڵ سەرکەوتن و ڕووداوی چاک ڕووبەڕوو بوون ‹پاشو شانست گفته! برنده شدی: هەستە بەخت ڕووی لیت کردووە! بردووتەوە›. هەروەها: **روی شانس بودن**

**شانسی**[١] / šānsî/: [فرانسوی]/سم. بەختەکی؛ خۆ و

بەخت؛ خوابەختەکی؛ شانسی؛ پڕ یان پووچ.

**شانسی**[٢]: *قید.* خوابەختەکی؛ شانسی؛ خۆ و بەخت؛ خواوڕاسان؛ بە هەڵکەوت ‹دستم را کردم توی کشو، شانسی این آمد توی دستم: دەستم کردە نێو کەشاوەکەوە، خوابەختەکی ئەمە هاتە دەسمەوە›.

**شانە** / šāne ، ـها/: *اسم.* ١. شانە؛ کۆڵ؛ کەت؛ شان؛ ناوشان؛ قولی؛ قەڵاندووش؛ ناوملان؛ نێوان هەر دوو پیل؛ بەشی ژوورینی لەشی مرۆ کە باڵ بە لەشەوە دەلکێنێ، بریتیە لە ئێسکی شان، جومگە و ماسوولکەکانی ‹شال سرخی روی شانەاش انداخته بود: شاڵێکی سووری خستبووە سەر شانی› ٢. شانە؛ شانی؛ چلچنگ؛ شە؛ شەهـ ؛ شەهک؛ شەهن؛ ئامرازی بە ڕیز ددانە داری سەر داهێنان ‹شانەاش را از جیبش درآورد: شانەکەی لە گیرفانی دەرهێنا› ٣. شە؛ بەوش؛ ئامرازێکی وەک شانەی سەر بۆ شیکردنەوەی خوری و.. ٤. *[نساجی]* دەفە؛ دەفینە؛ کەرکووتک؛ لیفە؛ کەرەسەیەک بۆ شیکردنەوە و تەکووزکردنی تانوپۆ، بەتایبەت خوری ٥. خەشاو؛ فیشکەدان؛ فیشەکلۆخ؛ فیشەکبەند: **شان** *[گفتاری]* ٦. شانە؛ دەفرئاسایەکی چاوەـچاوە بۆ ڕاگرتنی شتی ناسک ‹شانەی تخم‌مرغ: شانەی هێلکە› ٧. بەشێ لە نێوان زگ و ملی بڕێک دەفر (وەک بوتری؛ تونگە یان گۆزە) دا ٨. شانە؛ قەراخ جادە؛ پەراوێزی ڕێگا کە بۆ وەستانی ماشین ڕەچاوکراوە.

▣ **شانە بە شانە:** شان بە شان؛ پشت بە پشت؛ لوای‌لو؛ پاڵ بە پاڵ؛ دوو قۆڵی؛ لە پاڵ یەکدا.

**شانەی عسل:** شانەی هەنگوین؛ نانی نیشا؛ شانۆ/ شانەو هەنگوینی؛ نانێ هەنگڤی؛ ماڵەهەنگ؛ کۆمایەک لە چاوەگەلی ڕێکوپێکی شەش گۆشە لە مۆم کە هەنگ بۆ بەخێوکردن و پاراستنی بێچووەکانی و بەرهەم هێنانی هەنگوین، چێی دەکا: **شان عسل** *[گفتاری]*

**شانەی بافندگی:** بەوش؛ شە؛ شانەی نێوان کری جاجم، بۆ پەستاوتنی پۆ.

▣ **شانه بالا انداختن**: *[کنایی]* شان هەڵتەکاندن؛ لە ئاست شتێک لاڵووت بوون ‹شانەاش را بالا انداخت و چیزی نگفت: شانی هەڵتەکاند و شتێکی نەگوت›.

**شانه خالی کردن**: *[مجازی]* شان لادان؛ نەچوونە ژێر کار ‹می‌خواست شانە خالی کند و جواب مرا ندهد: دەیویست شان لادا و وەرامم نەداتەوە›.

**شانه زدن/ کردن:** شانەکردن؛ داهێنان؛ ئەرەئاردەی؛ ئاردەیرە؛ داهاوردنی موو ‹موهایش را شانە کرد: قژی شانەکرد›.

**شانه‌ای** / šāne'ī/: *صفت.* شانەیی: ١. وەکوو شانە. هەروەها: **شانه‌ای شکل** ٢. *[گیاه‌شناسی]* بە گەڵای ئاوێتەوە کە پەلکەکانی دووبەدوو بە دوولای دووچکەگەڵای سەرەکیەوە بن.

**شانه‌به‌سر** / šānebesar ، ـها/: *اسم.* *[گفتاری]* تیقرگ؛ پەپووسێمانە؛ چۆڕەپۆپنە؛ پەپوو سلێمانە؛ پەپووسلەمانکە؛ بووبووکەرە؛ شانەسەرە؛ هەپووک؛ هەپوو؛ کەڵەشێر پەیخەمبەری.

**شاه**[١] / šāh ، ـان/: *اسم.* شا؛ پادشا؛ پاوشا؛ پاڵشا؛ پاشا؛ شاهـ ؛ شەهـ : ١. کەسێ کە دەسەڵاتی وڵاتێک بۆ ماوەیەکی دڵخواز و بە شێوەی میراتی وەئەستۆ دەگرێ ‹شاه سوئد؛ شاه سابق: پادشای سوید؛ شای پێشوو› ٢.گرینگ‌ترین مۆرەی شەترەنج کە هەر لایەنێکی کایە، یەک دانەی هەیە ‹شاه سیاه کیش است: شای ڕەش کشە› ٣. لە خاڵەکانی وەرەق ‹شاه خشت: شای خشت› ٤. بەڕێوەبەری کایەی شاو وەزیر ‹بازی شاه و وزیر: کایەی شا و وەزیر›.

▣ **با شاه پالوده نخوردن**: *[کنایی]* ئاخوڕ بەرز/ چەور بوون؛ شا بە سەپانی خۆ نەزانین؛ خۆ لە

دیتران سەرتر زانین؛ دەمار نەهێنان (بەتایبەت بە بۆنەی ماڵ و سامان و پلە و پایەوە) ‹حالا دیگر آزاد با شاه پالوده نمی‌خورد: ئێستا ئیتر ئازاد شا بە سەپانی خوی نازانی›.

**شاهـ**[۲]: پیشوازە. شاـ: ۱. گرنگ؛ سەرەکی ‹شاهراه؛ شاه‌کلید؛ شاه‌لوله: شارێ؛ شاکلیل؛ شالوولە› ۲. شایانە؛ خاوەن چۆنیەتیەکی هەرەباش ‹شاه‌توت؛ شاه‌دانه: شاتوو؛ شادانە› ❊ **شاـ** *[گفتاری]*

**شاه‌اسپرغم** / šāhesparqam/ ☜ **اسپَرغم**

**شاه‌اندازی** / šāhandāzî/: *اسم*. کار یان ڕەوتی وڕ لێدان؛ قسەی قۆڕکردن؛ فرۆفیشاڵ کردن؛ هاش‌وهووش کردن؛ هەڵشلێگاندن.

**شاهانه** / šāhāne/: *صفت*. شاهانە؛ شایانە: ۱. پێوەندیدار یان پاڵدراو بە شاوە ‹توجه شاهانه: سەرنجی شایانە› ۲. وەک شا؛ بە ڕەوشی پاشایان ‹رفتار شاهانه: ئاکاری شاهانە› ۳. *[مجازی]* زۆر بەرز؛ هەڤیاز و شکۆدار ‹زندگی شاهانه: ژیانی شایانە›.

**شاهانی** / šāhānî/: *اسم*. شەهەیلی؛ سەهانی؛ ساهانی؛ سانی؛ جۆرێ ترێی سپی کە زوو پێ‌دەگا.

**شاهباز** / šāhbāz/ ☜ **شهباز**

**شاهبال** / šāhbāl، ـها/: *اسم*. شاپەڕ.

**شاه‌بالا** / šāhbālā/: *اسم*. برازاوا؛ برازاڤا؛ برازەما.

**شاه‌بلوط** / šāhbalût، ـها؛ ـان/: [از کردی] *اسم*. شابەڕوو؛ شابەلوو؛ کەستانە؛ بەڕووەخاسە؛ قسقە: ۱. ناوی گشتی چەن جۆرە درەختی گەورە لە تیرەی پیاڵەداران کە بەرێکی شیرین و بۆنخۆشیان هەیە ۲. کۆپەک؛ بەری داری شابەڕوو کە لە ناو پیاڵەیەکی دڕکاویدایە و خواردەمەنیە.

**شاه‌بوف** / šāhbûf، ـها؛ ـان/: *اسم*. شابوو؛ کوندەبوو؛ کوندەبەبوو؛ کوندی‌بۆر؛ گایە؛ بم؛ گەورەترین جۆری کوند لە ڕەگەزی بوو، بەگوێپەڕی درێژ و دیار، بان پشتی زەردی ئاماڵ قاوەیی و دەنگی ناحەزەوە، کە نێچیری گەورە وەک کەروێشک ڕاو دەکا.

**شاه‌بیت** / šāhbeyt، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم*. شابەیت؛ بەهێن چامە؛ تەڵ؛ باشترین و جوانترین بەیتی پارچە شیعرێک.

**شاهپر** / šāhpar، ـها/: *اسم*. سەربال؛ شاپەڕ؛ پەڕی دروشتی مەل؛ هەر کام لەو پەڕە گەورانەی کە لە سەر باڵی پەلەواران‌ن: **شاهبال**؛ **شهپر** *[ادبی]*

**شاهپرک** / šāhparak/ ☜ **شب‌پره ـ ۱**

**شاه‌پسند** / šāhpasand، ـها/: *اسم*. شاپەسەند؛ شاپەسەن؛ مینا؛ تەوقەگوڵ؛ تۆقەگوڵ؛ گیادەریمان؛ گیایەکی ئالفی یەک‌سالەی ڕازێنەییە لە تیرەی شاپەسەنان بە گەڵای برگەیی هەمبەر یان کۆز، گوڵی ڕەنگامەی ورد و نارێک، گوڵڕازێنی هیشوو و بەری وشک و دانەدانەی زۆرەوە، بۆ دەرمانی ڕشانەوە و ئاڵووی ناو دەم بەکاردێ.

**شاهپور** / šāhpûr، ـها/: *اسم*. شاپوور؛ کوڕەشا؛ کوڕی شا؛ کوڕوو شای؛ شازادە.

**شاهتره** / šāhtare، ـها؛ ـگان/: *اسم*. شاتەرە؛ شەتەرە؛ شاتەڕە؛ شیرین‌شاتەڕە؛ خوێن‌پاڵێن؛ چارەچەقیلە؛ چارانەچەقیلە؛ لیرا؛ شاپاقاهـ؛ گیایەکی ئالیکی یەک سالان، بە گوڵی هێشوویی سوور یان ئەرخەوانی.

**شاه‌توت** / šāhtût، ـها/: [فارسی/ آرامی] *اسم*. توت سیاه ☜ **توت**

**شاه‌تیر** / šāhtîr، ـها/: *اسم*. تیر حمال ☜ **تیر**

**شاهد** / šāhed/: [عربی] *اسم*. شایەت؛ شەهات؛ گۆڤا؛ گەڤا؛ گەوا؛ گوا: ۱. /ـها؛ ـان؛ شهود/ کەسێ کە لە کاتی قەومانی ڕووداوێکدا لەو شوێنەدایە و دەیبینێ ‹من شاهد بودم که موتورسوار زد به او: من شایەت بووم کە موتورسوارەکە لێیدا› ۲. /ـها؛ ـان؛ شهود/ ئەوەی کە لە دادگادا سەبارەت بە بابەتێ شایەتی دەدا ۳. /شواهد/ ئەوەی کە دیتنی ببێتە

هۆی دەرکەوتنی شتێکی‌تر ‹حضور او در محل و خون روی لباسش شاهد این مدعا است: بوونی ئەو لەو جێگەدا و خوێنی سەر جل‌وبەرگەکەی گەوای ئەم خوازەیە› ٤. لـها//ادبی/ ڕستە یان وتراوەیەک (شیعر یان پەخشان) کە لە سەر دروستی واتای وتە یان بابەتێک جەخت دەکا ‹برای هر جمله دو تا شعر هم شاهد می‌آورد: بۆ هەر ڕستەیەک دوو شیعریش گەوا دێنێتەوە›.

▣ **شاهد از غیب رسیدن:** گەوا لە ئاسمانەوە داکەوتن؛ لە ناکاو هاتنی کەسێ کە ڕاستی قسە یان ڕووداو دەرخا.

**شاهد آوردن:** ۱. شایەت هێنانەوە؛ شایەت هاوردن؛ گۆڤا هێنان؛ گوا هێنانەوە؛ هاوردن یان ناسینەوەی کەسێک بە ناو شایەت ‹حاضرم ده تا شاهد بیاورم که آن شب در خانه بودم: ئامادەم دە کەس شایەت بینمەوە، کە ئەو شەوە لە ماڵەوە بووم› ۲. نموونە هێنان؛ باس‌کردنی قسەیەک لە دیتران بۆ سەلماندنی ڕاستی وتەیەک ‹شعر حافظ را شاهد اورد: شیعری حافزی شایەت هینا›.

**شاهدانه** / šāhdāne ، ـها؛ ـگان/:/اسم. شاینە؛ شادانە؛ شەدانک؛ شەدانە؛ شادان؛ شاگانە: ۱. گیا کەندەر؛ گیایەکی ئاڵفی لە تیرەی شادانان بە گەڵای پەنجەیی ئاوێتەی بۆن تیژ، گوڵی نێر و مێ و گوڵ‌ڕازێنی هێشوویی و بەری فنۆقی و ناوکەیەکی بێ ئالبومینەوە ۲. دانەی ئەو گیایە کە چەور و خۆراکیە.

**شاهدخت** / šāhdoxt ، ـها/:/اسم. کچەشا؛ کچی شا؛ کناچۆ/ کناچە شای؛ شاکچ.

**شاهراه** / šāhrāh ، ـها/:/اسم. شاڕێ؛ شاڕا؛ شارێگە؛ ڕاسەڕێ؛ کاروانەڕێ؛ شۆسە؛ ڕێی سەرەکی کە چەند شار پێکەوە دەلکێنێ و چەن ڕێ گچکەشی لێ‌دەبێتەوە.

**شاهرگ** / šāhrag ، ـها/:/اسم. کەزیگە؛ شاڕەگ؛ شادەمار؛ تەمار؛ دەمارەگەورە؛ هەرکام لەو دوو ڕەگەئەستوورە کە لە دوو لاملی مرۆڤەوە تێ‌دەپەڕن.

▣ **شاهرگ کسی جنبیدن:**/کنایی/ ڕەگی کەسێک فڕین؛ خوێن لە ڕەگدا بوون؛ تا مانی کەسێک؛ تا مەنەو یۆی؛ دڵی کەسێک لێدان؛ هێشتا زیندوو بوون ‹تا شاهرگم می‌جنبد دست از این کار نمی‌کشم: تا ڕەگم دەفڕێ دەس لەم کارە هەڵناگرم›.

**شاهرگ کسی را زدن:**/کنایی/ گیانی کەسێک کێشان؛ کەسێک بردنە شەرای مەرگەوە؛ کەسێک تا شەرای مەرگ ئەشکەنجەکردن ‹اگر شاهرگ مرا هم بزنند از حرفم برنمی‌گردم: ئەگەر گیانیشم بکێشن لە قسەکانم پاشگەز نابمەوە›: **شاهرگ کسی رفتن**

**شاهرگ کسی رفتن** ☜ **شاهرگ کسی را زدن**

**شاهزاده** / šāhzāde ، ـها؛ ـگان/:/اسم. شازا؛ شازدە؛ شازادە: ۱. منداڵی شا ۲. کەسێ کە لە بنەماڵەی شایە.

**شاهسپرم** / šāhesparam / ☜ **اِسپَرْغَم**

**شاه‌فنر** / šāhfanar ، ـها/: [فارسی/ ترکی]/اسم. شافەنەر؛ پەڕەیەکی پۆڵایینی فەنەری کە لە ژێر ئۆدەی ماشیندایە و فەنەرەکانی‌تری لە سەر سوارن.

**شاهکار** / šāhkār ، ـها/:/اسم. شاکار: ۱. کاری یەکجار سەیر و سەمەر و بەرچاو ‹با این وزنه‌ای که برداشت واقعاً شاهکار کرد: بەم وەزنەوە هەڵیگرت بە ڕاستی شاکاری‌کرد› ۲. بەرهەمی وێژەیی یان هونەری کە نیشانەی مامۆستایی و لێزانی داهێنەرەکەیە ‹گلستان سعدی از شاهکارهای ادبیات جهان است: گوڵستانی سەعدی لە شاکارە وێژەییەکانی جیهانە›.

**شاه‌کلید** / šāhkilîd ,-kêlîd ، ـها/: [فارسی/ یونانی]/اسم. شاکلیل؛ شاکلێل؛ کلیلێ بە ددانەی زۆرەوە کە زنجیرە قوڵفگەلی کارخانەیەکی سازێنەری پێ دەکرێتەوە.

**شاه‌لوله** / šāhlûle ، ـها/:/اسم. شالووله؛ شابۆری؛ لوولەی ئەستووری سەرەکی بۆ گواستنەوەی تراو یان گاز.

**شاه‌ماهی** / šāhmāhî ، ـها؛ ـان/:/اسم. شابۆری؛ شاماسی؛ چەشنێ ماسی چکۆلە، بە لەشی پوولەکەیی و سەری بێ پوولەکە، چوار درزی ئاوسی و باڵەی نیوەنەرمەوە، کە مۆرەیان نیە و گەراکەیان تۆپەڵ-تۆپەڵی پێکەولکاوە: **شاه‌ماهی آزاد**

▣ **شاه‌ماهی آزاد** ☜ **شاه‌ماهی**

**شاه‌مقصود** / šāhmaqsûd/: [فارسی/ عربی]/اسم. شامەقسوو؛ بەردێکی کارەبایی بەبایەخ کە تەزبێحی لێ درووس دەکەن.

**شاهنامه‌خوان** / šāhnāmexān ، ـها/:/اسم. شانامەخوێن؛ ئەوەی کە بە دەنگی بەرز و بە ئاهەنگێکی تایبەتەوە شیعرەکانی شانامە (دانراوەی فیردەوسی، ئەبولقاسم مەنسوور، دەور و بەری ٣٢٩ ـ ٤١٥ ک.م) بۆ خەڵکی دەخوێنێتەوە. هەروەها: **شاهنامه‌خوانی**

**شاهنشاه** / šāhanšāh ، ـان/:/اسم. شاهەنشا؛ شای‌شایان؛ پاڵشای پاڵشایان؛ نازناوی شاکانی ئێران.

**شاهنشاهی** / šāhanšāhî/: صفت. شاهەنشایی؛ شاهانە؛ پادشایانە؛ پاشایانە؛ پاڵشایانە؛ شایانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە شاهەنشاوە ‹دربار شاهنشاهی: کۆشکی شاهەنشاهی›.

**شاه‌نشین** / šāhnešîn ، ـها/:/اسم. [قدیمی] شانشین؛ باڵاخانە؛ ئۆدەیەکی گەورە بە لەپێ هەندێ بەرزتر و کۆڵەکەی ڕازێنەیی یان بە شێوەی ئۆدەیەکی چکۆلەتر لە نێو ئۆدەیەکی تردا، بێ‌دەرک و دیواری جوێ‌کەرەوە.

**شاهوار** / šāhvār/: صفت. ١. شاهانە؛ شایانە؛ شیاوی شایان ‹گوهر شاهوار: گەوهەری شاهانە› ٢. نایاب؛ هەڵکەوتە؛ زۆر باش و بێ‌وێنە ‹شعر شاهوار: هەڵبەستی نایاب›.

**شاهی**[1] / šāhî/:/اسم. شایی: ١. شاهی؛ پادشاهی؛ پاوشایی؛ پاڵشایی؛ پاڵشایەتی؛ کار یان پلە و پایەی شا ‹به شاهی نشست: بە شایی گەیشت› ٢. /ـها/[قدیمی] یەکەی کۆنی پارەی ئێران بەرانبەر بە پێنج دینار ٣. /ـها/ دێژنک؛ تووزەک؛ ڕەشادۆک؛ تەڕەتیزە؛ تەڕەتووزە؛ گیایەکی یەکساڵەی بۆنخۆشە، گوڵی سپی دەدا و گەڵاکەی دەخورێ.

▣ **شاهی آبی**: کووزەڵە؛ بریەمێ؛ گیاییکە خواردەمەنی، بە گەڵای سەوز و گوڵی سپی یان زەردەوە، لە ئاودا دەڕوێ، تامی توونی هەیە و بۆ دەرمانیش دەشێ.

**شاهی فرنگی**: کک کوچ خوراکی ☜ **کک‌کوچ**

**شاهی**[2]: صفت. شایی؛ شاهی؛ پاوشایی؛ پاشایی؛ پادشایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە شاوە ‹تاج شاهی: تاجی شایی›.

**شاهین** / šāhîn/:/اسم. ١. /ـها/ باهوو؛ شاهێن؛ شایەن؛ شەهین؛ شایێن؛ داری درێژی تەرازوو کە تەرازووی لێ قایم دەکەن ٢. شەهێن؛ شاهێن؛ تیرەیەک لە پەلەوەرانی ڕۆژ ڕاوکەری تاکەژی، لە ڕیزی بازئاسان، بە باڵ و کلکی درێژ، دەندووکی کورتی وەک قولاو کە زۆر تیژفڕن و نێچیریان لە کاتی فڕیندا دەگرن: **قوش** ٣. /ـها/ شاهێن؛ شەهێن؛ مکۆر؛ پەلەوەرێکی ڕاوکەرە لە تیرەی شاهێن سمێڵێکی قاوەیی ئاماڵ ڕەشی هەیە ٤. [نجوم] وێنەیەکی گەردوونی گەورە لە ئاسمانی نیوەگۆی باکووریدا بە شێوەی باڵەوازەی هەڵۆ: **عقاب**.

**شایئی** / šāyā'î/ ☜ **شایایی**

**شایان** / šāyān/: صفت. شایان؛ هێژا؛ شیاو؛ لێهاتوو؛ وەشاو؛ لەبار؛ سزاوار؛ پێ‌شان؛ باو؛ حەل؛ مەشیا؛ هەژی؛ بەرکەتی؛ لایق؛ شایستە؛ پەسند و لەبەر دڵ و چاو.

▣ **شایان توجه**: شیاوی سەرنج؛ لەبار بۆ ڕەچاو

کردن یان ئاوڕدانەوە.

**شایایی** / šāyāyî ، ـھا/: *اسم. [ادبی]* لێھاتوویی؛ ھێژایی؛ لێوەشاوەیی: **شایائی**

**شـایبە** / šāyebe ، ـھا/: [عربـی] /*اسـم.* خـلتە؛ خەوش؛ ناپاکی؛ پیسی؛ پێوەتـلاوی؛ چەپەڵـی؛ تێکەڵاوی ‹می‌خواست رفتارش عـاری از شایبەی ریـا باشد: دەیەویست ئاکاری بـە دوور لـە ھـەر چەشنـە خلتەی مەرایی بێ›: **شائبە**

**شـایـد** / šāyad ، ـھـا/: *قیـد.* ڕەنگـە؛ ڕەنگـا؛ وێـدەچێ؛ گاھـەن؛ گاھـەز؛ گاھـەس؛ گـاس؛ گـەھاس؛ شـایەت؛ شـایەدا؛ دینـایی؛ ئەشـێ؛ دەشـێ؛ شـۆ؛ قـەمی؛ شـایەتا؛ لاک؛ شـاکم؛ مـەبتکـۆ؛ وشـەیەک کـە ئەگـەری ڕوودانی ڕووداوێـک دەگـەیێنێ ‹شـاید بیایـد و شـاید ھـم نیاید: ڕەنگە بێت و ڕەنگە نەیێت›.

**شاید و باید** / šāyad-o-bāyad ، ـھا/: *اسم.* شیاو؛ ئەشیا و مەشیا؛ ئەشێ و بشێ ‹آن طور که شـاید و باید کار پیش نمی‌رود: ئەو جـۆرە کـە شـیاوە کارەکـە ناچێتە پێشەوە›.

**شایـستگی** / šāyestegî ، ـھا/: *اسم.* لێھـاتوویی؛ ژێھـاتوویی: ١. ھێژایـی؛ ھـەژیاتی؛ شاسـەیی؛ شیاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شیاو بوون ‹شایستگی ھر کس در ھنگام کار کردن معلوم می‌شود: لێھـاتوویی ھـەر کەسـێک لـە کـاتی کارکردنـدا دەردەکـەوێ› ٢. دۆخ یان چۆنیەتی ھەبوونی زانایی و توانـایی پێویست ‹او شایستگی لازم را نداشت: ئەو لێھـاتوویی پێویستی نەبوو›.

**شایستە** / šāyeste/: *صفت.* شیاو؛ شـایان؛ شاسـە؛ لێھاتوو؛ ژێھاتی؛ لێھاتی؛ لێھاتگ؛ ھێـژا؛ ھـەژیا؛ پێکەفتگ؛ بەژمێر؛ ھەژی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی شیاوی ‹مقام شایستە؛ شغل شایستە: پلەوپایەی شیاو؛ کاری شایان› ٢. بەرکـەتی؛ ھـەبوونی ھێـز یـان دەردخـواردوویی ڕەچـاوکراو ‹کـارگر شایـستە: کرێکاری لێھاتوو› ٣. ھاوتـەراز و ھـاوڕێ لەگـەڵ کار یـان ئامـانجی دیـاریکراودا ‹تـلاش شایستە: کردوکۆشی شیاو›. ھەروەھا: **شایستە بودن**

**شایستەسالاری** / šāyestesālārî/: *اسم. [سیاست]* ھێژامەزنی؛ ھێژاسالاری؛ شیاومەزنی؛ ڕژیمێکـی حکوومـەتی کـە بـە پێـی لێھـاتوویی (زانـایی، ئـەزموون و توانـایی) پایەبـەرزان لـە ناویـدا ھەڵدەبژێردرێ و کار و باریان پێ ئەسـپێردرێ. ھەروەھا: **شایستەسالار**

**شـایع** / šāye'/: [عربـی] *صـفت.* بـڵاو؛ پـەخش؛ داکەوتوو و پەرە گرتوو لە نێو کۆڕێکدا.

▣ **شایع شدن**: ١. داکـەوتن؛ بڵاوەکـردن؛ پـەرە سەندن ‹بیماری اسھال در میان کودکان شایع شده بود: نەخۆشـینی زگەشـۆڕە لـە نێـو مندالانـدا داکەوتبوو› ٢. دەنگۆ داکەوتـن؛ زران؛ زرپـان؛ بە شێوەی قاو (ھەواڵی نەڕاست و نەدرۆ) لە نێو خەڵکیدا بڵاوەکردن ‹شایع شد کـە مـی‌خواھنـد کوپن بدھند: دەنگۆ داکەوت کە دەیانـەوێ کـۆپین بدەن›.

**شایعات** / šāye'āt/: [عربی] جمعِ ☜ **شایعە**

**شایعە** / šāye'e ، ـھا؛ شایعات/: [عربی] /*اسم.* دەنگـۆ؛ وتە؛ واتۆ؛ بەنگ‌وباو؛ بەندوباو؛ وتە وت؛ قاو؛ گوتە؛ گۆتە؛ گۆتەگۆت؛ ڕاوچاو؛ چلچاو؛ لۆغـەت؛ گوتـۆ ‹شایعەای پخش شد کە قرار است طلا گـران بـشود: دەنگۆیەک داکەوت کە بڕیارە زێڕ گران ببێ›.

**شـایق** / šāyeq/: [عربـی] *صـفت. [ادبی]* تامـەزرۆ؛ خوازیار؛ بـە تاسـە؛ بەشـەوق؛ داواکـار ‹پـدرم بـە دیدارتان شایق بـود: بـابم تامـەزرۆی دیتنتـان بـوو›: **شائق**

**شایورد** / šāyvard/: *اسم. [ادبی]* خەرمانە؛ ئاخـڵە؛ خۆخێنە؛ خەرمانەی مانگ.

**شـئامت** / še'āmat, ša'āmat/: [عربـی] /*اسم.* نەحسی؛ دوومۆری؛ دۆبڕی؛ بێولەتی؛ بەدفـەڕی؛ نامەتی؛ بەویومنی؛ ناوچاوڕەشی؛ بەدودمی.

**شئون** / šo'ûn ، ـات/: [عربی] جمعِ ☜ **شأن**

**شئونات** / šo'ûnāt/: [عربی] جمعِ ☜ **شئون**

**شـب**[1] / šab ، ـھا/: *اسم.* شـەو؛ شـەڤ؛ شـەوە؛

مەودای نێوان دوو ڕۆژ کە لە تاریک بوونی هەوا هەتا ڕوون بوونەوەی دیاری دەکرێت؛ کاتێ کە بە دوای ئێوارەوە دەست پێدەکا و هەتا کازیوە دەخایێنێ.

▣ **شب احیا:** */اسلام/* شەوی ئەحیا؛ شەوی ڕۆژکردنەوە؛ دە شەوی ئاخری مانگی ڕەمەزان (زۆرتر شەوانی تاقی ئەو دە شەوە).

**شب برات:** شەوی بەرات؛ شەوی پازدەی مانگی هەشتەمی کۆچی.

**شب به شب:** شەو بە شەو؛ شەوانشەو؛ شەوە و شەو؛ شەونەشەو؛ هەموو شەوێک ‹شب به شب می‌آمد؛ شب به شب یک قرص بخور: شەو بە شەو دەهات؛ شەوانشەو حەبێک بخۆ›.

**شب پیش:** دوێنێ شەو؛ دوێشەو؛ هێزی شەوێ.

**شب تاریک:** تاریکە شەو؛ شەفتاری؛ شەڤتاری؛ شەوەزەنگە؛ شەوی تاریک و بێ‌تریفەی مانگ.

**شب جمعه:** شەوی هەینی؛ شەو جومعە؛ شەوێ کە بەیانیەکەی هەینیە. هەروەها: **شب شنبه؛ شب اول ماه**

**شب چلّه** ☜ **شب یلدا**

**شب دیجور:** */ادبی/* شەوی زستان؛ شەوی شووتی شکان/ هەنی شکان؛ شەوی یەلدا؛ یەکەم شەوی بەفرانبار ٢. */مجازی/* شەوەزەنگ؛ شەوەزەنگە؛ تاریکەشەو؛ تاریکەشەوە؛ شەوی تاریک و بێ‌دەنگ و ئەنگوستەچاو.

**شب شعر:** شەوی شیعر؛ ئێوارە شیعر؛ ڕێوڕەسمێکی شەوانە کە چەند شاعیرێک تێیدا هۆنراوەکانی خۆیان بۆ دانیشتوان دەخوێننەوە.

**شب عید:** ١. شەو/شەوی نەورۆز؛ شەوۆ نەورۆزی؛ دوایین شەوی ڕەشەمە ٢. شەوی جێژن؛ ئەو شەوەی بەیانیەکەی جێژنە ٣. */مجازی/* دوایین ڕۆژەکانی مانگی ڕەشەمە.

**شب قدر:** شەوی قەدر: ١. شەوی زۆر پیرۆز ٢. دە شەوی ئاخری مانگی ڕەمەزان (زۆرتر شەوانی تاقی ئەو دە شەوە).

**شب هفت:** حەفتە؛ حەوتەمین ڕۆژ و شەوی پاش مردنی کەسێ کە ڕەنگە هاوڕێ بێ لەگەڵ ڕێوڕەسمی تایبەتدا ‹فردا شب هفت مادرشوهرم است: سبەینێ حەفتەی خەسوومە›.

**شب یلدا:** ١. شەوی زستان؛ شەو زمسان؛ شەوۆ زمسانی؛ شەو یەلدا؛ یەکەمین شەوی مانگی بەفرانبار: **شب چلّه**

▣ **شب را به روز آوردن:** ڕۆژکردنەوە؛ ڕۆوە کەردەی؛ ڕۆکەردەیوە؛ شەو بە سەر بردن: **شب را گذراندن**

**شب را گذراندن** ☜ **شب را به روز آوردن**

**شب شدن:** شەو داهاتن؛ شەو هاتن؛ شەو گەییشتن؛ بوونە شەو؛ شەوەرە بیەی؛ شەوەوە ئامەی.

**شب و روز خود را ندانستن:** شەو و ڕۆژ لێ تێکچوون/ شێویان؛ شەو و ڕۆ ونە گم بیەی؛ گیرۆدەی خەم و پەژارەی زۆر بوون.

**از شب رفتن/ گذشتن:** لە شەو لادان؛ شەو تێپەڕ بوون؛ لە شەو ڕۆیین؛ جە شەوێ ترازیەی ‹دو ساعت از شب می‌رود و هنوز از شام خبری نیست: دوو ساعەت لە شەو لایداوە و هێشتا لە شێو باسێک نیە›.

**شب**[٢]: *قید.* شەو؛ شەوە؛ شەوانە؛ بە شەو؛ شەوەنە؛ شەوێ؛ لە کاتی شەودا ‹شب می‌خوابیم؛ شب هوا تاریک است: شەو دەخەوین؛ بە شەو هەوا تاریکە›.

**شباب** / šabāb/: [عربی] */اسم. /ادبی/* لاوی؛ لاوەتی؛ گەنجی؛ خورتی؛ جەوانی؛ جحێلی؛ جاهێلی؛ هەرزەکاری.

**شب ادراری** / šab'edrārî, šabedrārî/: [فارسی/ عربی] */اسم.* مێزەڵی؛ کەمەرشلی؛ چۆنیەتی مێزتن

له خەودا.

**شباط** / šabāt/: [سریانی]/اسم. شـوبات؛ فیـڤریە؛ مانگی دووهەمی ساڵی هـەتاوی لـە ڕۆژمێـری بـڕێ لـە وڵاتـە عەرەبیەکانـدا، کـە لـە ١٠ی ڕێبەندانەوەیە.

**شبان** / šabān ، ـها؛ ـان/: اسم. [ادبی] شوان؛ شڤان؛ شـوانە؛ مێگـەڵوان؛ مێگەلـەوان؛ بەرخـڤان؛ بەرگەلەوان؛ بەرغەلەوان؛ گەلەوان؛ گاوان.

**شبان‌فریبک** / šabānfarîbak ، ـها؛ ـان/: اسم. شـوانخەڵـەتێنە؛ شـوانخەڵـەتێن؛ شوان‌هەڵخەڵـەتێنە؛ شوانەخەڵـەتن؛ شـڤانکوژ؛ شڤان‌خاپێن؛ مەلێکی پچـووکی بۆرەڵـۆکەیە لـە پاساری گەورەتر.

**شبانگاه**[1] / šabāngāh/: اسم. [ادبی] کـاتی شـەو؛ شەوار؛ شەووار؛ شەڤتاری؛ شـەفتـاری ‹روزی تـا شبانگاه بر کنار آب نشسته بود: ڕۆژێک هەتا کاتی شەو لە زێواری ئاوەکەوە دانیشتبوو›.

**شبانگاه**[2]: قید. [ادبی] کاتی شەو؛ شەو؛ شەوەکـی؛ شەوێ ‹روزی تا شب رفته بـودیم و شـبانگاه بـه پـای حصاری خفتـه: ڕۆژێک هـەتا ئێـواران ڕۆیـشتبووین و کاتی شەو لە پای پەرژینێکدا نووستبووین›.

**شبانگاهان** / šabāngāhān/: قید. [ادبی] بـەشـەو؛ شــەوانـە؛ شـەڤـانە؛ شـەوگـار؛ شـەو؛ شـەوێ؛ سەرانسەری شەو؛ لە کاتی شەودا ‹شبانگاهان بـه دروازەی شـهر رسـید: بـە شـەو گەیـیشتە دەروازەی شار›.

**شـبانگاهی** / šabāngāhî/: صفت. شـەوگـاران؛ شەوگاری؛ شەواری؛ پێوەندیـدار یـان سـەر بـە کاتی شەوەوە ‹نسیم شبانگاهی: شنەی شەوگاران›.

**شبانگردان** / šabāngardān/ ☜ **شبگردان**

**شـبانه**[1] / šabāne/: صـفت. شـەوانە: ١. شـەوان؛ شێوان؛ شەوێ؛ پێوەندیدار بە شەوێکەوە ‹غـذای شـبانه: خواردەمـەنی شـەوانە› ٢. پێوەندیـدار بـە شەوەوە ‹کار شبانه؛ مدرسەی شبانه: کـاری شـەوانە؛ قوتابخانەی شەوانە›.

**شبانه**[2]: قید. شەوانە؛ شێوان؛ بە شەودا؛ بە شێوان؛ لە درێژایی شەوێکدا ‹شبانه ده نفر را در منـزلش جـا می‌داد: شەوانە دە کەسی دەبردە ماڵەوە›.

**شـــبانه‌روز** / šabānerûz/: اســم. شـــەو و ڕۆژ؛ شــــەوانەڕۆژ؛ یەکـــەی کـــات (زەمـــان) لـــە ڕۆژهەڵاتنێکەوە تا ڕۆژهەڵاتنێکی‌تر ‹هر شبانه‌روز ٢۴ ساعت است: شەو و ڕۆژێک ٢٤ سەعاتە›.

**شـــبانه‌روزی**[1] / šabānerûzî ، ـهـــا/: اســـم. شــەوانەڕۆژی؛ شـــەوانـــڕۆژی؛ فێرگـــەیێ کـــە قوتابیەکانی شەو و ڕۆژ لەوێـدان و جـێ خـەو و خۆراکیان بۆ دابین کراوە: **مدرسەی شبانه‌روزی**

**شبانه روزی**[2]: صفت. شـەوانەڕۆژی؛ شـەووڕۆژی: ١. خـاوەن چـالاکی بـە درێژایـی شـەو و ڕۆژ ‹داروخانـــەی شـــبانه‌روزی؛ مدرســـەی شـــبانه‌روزی: دەواخانەی شەوانەڕۆژی؛ قوتابخانـەی شـەووڕۆژی› ٢. پێوەندیدار بـە هـەموو کـاتی شـەو و ڕۆژەوە ‹فعالیـت شـبانه‌روزی؛ مراقبـت شـبانه‌روزی: چـالاکی شەوانەڕۆژی؛ چاوەدێری شەووڕۆژی›.

**شبانی** / šabānî/: اسم. [ادبی] شـوانی؛ شـڤانی؛ بەرگەلـــەوانی؛ شـــوانیەتی؛ شـــەوونی؛ کـــاری ئاگاداری لە مەڕ و ماڵات و لەوەڕاندنیان.

**شـباویز** / šabāvîz ، ـها/: اسم. [ادبی] تووتـاک؛ قژاوکـــە؛ قژاکـــە؛ قژاڵـــکە؛ تـــاق‌تـــاق‌کـــەرە؛ حـەق‌ـحـەق‌کـەرە؛ پـەلـەوەرێکـی بووئاسـایە، زیـــاتر بـــە شـــەوان و بـــە دەنگێکـــی ناتـــەواو دەخوێنێ.

**شباهت** / šabāhat, šebāhat ، ـها/: [عربـی]/اسـم. مانایش؛ وێکچوونی؛ وێچوونی؛ وێ؛ وەک‌یەکی؛ وەکیەتی؛ شبە؛ درووڤ؛ درووب؛ ڤەرجێ؛ تزبۆر؛ قام؛ میناهی؛ هاوشێوەیی؛ مینین؛ چـون‌یـەکی؛ نۆلانی؛ میناکی؛ لە یەک چوونی؛ لێـک‌چـوونی؛ دۆخ یان تایبـەتمەندیـەک (وەک بـیچم، ڕەنـگ، چۆنیەتی و...) هاوبەش لە نێوان دوو یـان چەنـد شتدا.

▣ **شباهت لفظی**: وێکچـوونی وتـەیی/ زارەکـی؛

دوو یان چەند وشە کە وتنیان وەکوو یەکە، وەک شیر (شمشێر) و شیر (خواردەمەنی).

**شباهت معنوی**: وێکچوونی واتایی؛ وێکچوویی مانایی؛ دوو یان چەند وشە کە واتاکانیان وەکوو یەکە، وەک قورس و گران؛ پەلەوەر و باڵدار.

**شباهنگ** / šabāhang/: اسم. [ادبی] ۱. [نجوم] شعرای یمانی ☜ **شِعرا** ۲. ـها/ سەرخوونک؛ بولبول؛ بلبل؛ بولبوڵ؛ بلبل؛ واف؛ پەلەوەری دەنگ خۆشی سترانبێژ.

**شب بو** / šab.bû ، ـها/: اسم. شەوبۆ؛ شەوبۆن؛ شەوبۆسان؛ شەڤبۆ؛ گیابەن؛ گیایەکی ڕازێنەیی، بە گوڵی چوارپەڕی بۆنخۆش و زەرد یان زەردی ئاماڵ قاوەیی (لە جۆرگەلێتریدا بە ڕەنگی سوور، خورمایی یان بنەوش)، گەڵای ساکاری باریک و نووک تیژ و تووکنەوە: **خِیری**

**شب به خیر** / šab.bexeyr/: [فارسی/ عربی] دعا. شەوباش؛ شەوەوەش؛ شەوێکی خۆش؛ شەو خوەش؛ ڕێز وشەیێ کە دە شەودا بۆ سڵاو و ماڵئاوایی دەگوترێ، واتا هیوادارم شەو بە خۆشی بەرنە سەر.

**شب بیدار** / šab.bîdār ، ـها/: صفت. شەونخوون؛ شەونەخووس؛ شەونشین؛ شەوبێدار؛ شەڤۆک؛ بە تایبەتمەندی نەخەوتن بە شەودا.

**شب بیداری** / šab.bîdārî/: صفت. شەونخوونی؛ شەونخووسی؛ شەونوخسی؛ شەوخوونی؛ شەوبیداری؛ ڕەوتی نەخەوتن لە شەودا.

**شب پا** / šabpā ، ـها/: اسم. شەوبەیار؛ شەوبێدار؛ پارێزەری شەوانە، کەسێ کە بە شەودا پاسەوانی بدا، بەتایبەت لە نێو باخ و مەزرادا.

**شب پرواز** / šabparvāz ، ـها؛ ـان/: صفت [جانورشناسی] شەوفڕ؛ بە تایبەتمەندی فڕین لە شەودا.

**شب پره** / šabpare ، ـها؛ ـگان/: اسم. ۱. شاپەریک؛ پریریک؛ پەڕپەرک؛ پەڕپەڕۆک؛ پەپوولە: **شاپرک** ۲. [قدیمی] چەکچەکی؛ چلیـچلی؛ چڵ؛ چێلەمێ؛ چەکچەکێڵە؛ چەکچەکیلە؛ شەڤرەنگ؛ شەڤرەڤینک؛ شەڤرفیک؛ شەڤرەوین؛ شەڤرەڤین؛ شەڤشەڤۆک؛ شەڤکۆر؛ قەژناقووچ؛ قەژناقووچە؛ شەمەلەکۆرە؛ مەشموولەکۆرە؛ شەمەڵە؛ شەمشە؛ شەمشەڵە؛ پارچک؛ جلجیلی؛ چەکچەکۆڵە؛ شەمشەمەکوێرە.

**شبت** / šebet ، ـها/: اسم. شویت؛ شێوت؛ شویتە؛ شووتە؛ دوراخ: ۱. گیایەکە لە سەوزەوات، گەڵاکانی ورد و زەیتوونی ڕەنگی لە شێوەی چەترە ۲. گەڵای ئەو گیایە کە بۆنخۆش و خوراردەمەنیە و وەک هەزوێڵە دەیکەنە نێو چێشتەوە **شود؛ شوید** [گفتاری]

**شبتاب**[1] / šabtāb ، ـها/: اسم. گوڵەئەستێرە؛ گوڵئەستێرە؛ گوڵەستێرە؛ گوهسارە؛ گیئاسارە؛ ئەیرەقوولە؛ ئەستێرۆک؛ مێروویەک لە تیرەی گوڵەئەستێرە بە ئەندازەی ۱۱ تا ۱۳ میلیمیتر، قاوەیی ڕەنگ، مێوینەکانیان بێباڵن و لە شەودا دەدرەوشێنەوە.

**شبتاب**[2]: صفت. شەونما؛ شەودرۆش؛ شەوبریس؛ بە تایبەتمەندی درەوشانەوە لە تاریکیدا: **شبنما**

**شبتابی** / šabtābî/: اسم. شەونمایی؛ شەوی بریسی؛ شەودرۆشی؛ دۆخ یان چۆنیەتی درۆشانەوە لە تاریکیدا.

**شبچراغ** / šabčerāq ، ـها/: اسم. شەوچرا؛ گەوهەرێکی دیرۆکیە کە گوایە لە تاریکی و شەودا هەر وەک تیشکی چرا دەدرەوشێتەوە.

**شبچره** / šabčare, šabčere ، ـها/: اسم. شەوچەرە؛ شەوچەرەز؛ شەوچەلە؛ ئاجیل و میوەیەک کە لە بە شەودا دەیخۆن.

**شبح** / šabah ، ـها؛ اشباح/: [عربی] اسم. ۱. تاپۆ؛ قەرە؛ قەرەنتوو؛ تارمایی؛ دۆلپا؛ تیبا؛ سای؛ سامۆتک؛ سوێس؛ قەراتە؛ سەهویر؛ سەهەنە؛

سەهەنگ؛ سەهەندە؛ دێوجامە؛ شتی خەیاڵی کە دێتە بەر چاو ٢. *[مجازی]* دێوەزمە؛ ئەو شتەی کە دەبێتە هۆی ترس و قینی هەمیشەیی ‹شبح جنگ؛ شبح گرسنگی: دێوەزمەی شەڕ؛ دێوەزمەی برسیەتی›.

**شبخسب** / šabxosb ، ـها/: *اسم*. پاقلەمارانە؛ پاقلەی دێوانە؛ دارجەوی؛ ئەکاکی؛ شەوگەشە؛ گوڵهەوریشم؛ دار یان دەوەنێکی ڕازێنەیی تایبەت بە ناوچەی گەرمێن، بە لق و پۆی چەترئاسا، گوڵی زەرد یان پەمەیی، گەڵای ئاوێتەی شانەیی و پەلکی وا کە شەوانە دووبەدوو دەنووشتێنەوە. بۆ بتەو کردنی زەوی بە کار دێ.

**شبخوش** / šabxoš/: *دعا*. شەوێکی خۆش؛ شەوباش؛ شەوەوەش؛ وتەیێ کە شەو لە کاتی لێکجودابوونەوە دەگوترێ، واتا: بە هیوام کە شەوێکی خۆشتان بێت ‹من رفتم، شبخوش!: من ڕۆیشتم، شەوێکی خۆش!›.

**شبدر** / šabdar ، ـها/: *اسم*. شەوەر؛ شەوەرگ؛ شەورگ؛ شەوەری؛ شەودەر؛ شاودەر؛ شەبدەر؛ شەڤدەر؛ شوور؛ هەندەقۆ؛ هەندەکۆ؛ هندکۆ؛ هەنەکە؛ بارێزە؛ دانۆک؛ سێپەڕە؛ سێوەرە؛ گیایەکی ئالفی گوڵداری یەکساڵە، دووساڵە یان پایایە بە گەڵای سێپەڕەیی و هێشووەگوڵی خڕی ئاڵ، سوور، ئەرخەوانی، سپی یان دوورەنگەوە کە بۆ لەوەڕی ماڵات دەکێڵدرێ.

**شبرم** / šaram/: *صفت*. *[گیاهشناسی]* شیرمارە کێویلە؛ جۆرێ لە ڕووەکی شیرمار، بە گوڵی شین و پچووکەوە، قەدەکەی ژەهراویە.

**شبرنگ**[1] / šabrang ، ـها/: *اسم*. شەورەنگ؛ ماکێکی ڕەنگیە کە لە تاریکاییدا نوور لێ بدا، دەدروشێتەوە.

**شبرنگ**[2]: *صفت*. ١. ـها/ شەورەنگ؛ بە ماکێکی ڕەنگی کە لە نێو تاریکیدا ئەگەر نوور لێ بدا، بدرەوشێتەوە ٢. *[ادبی]* شەڤین؛ ڕەش؛ تاریک و تنۆک وەکوو شەو.

**شبرو** / šabrow/: *صفت*. شەورۆ؛ شەوەڕەو؛ شەڤرۆ: ١. بەتایبەتمەندی لە شەودا ڕۆیین ‹اتوبوس شبرو: پاسی شەورۆ› ٢. ـها/ شەڤۆک؛ شەوگەرد؛ شەوگەڕ؛ خاوەن چالاکی شەوانە: **شبگرد**

**شبرو** / šebro/ ☜ **شِوْرُو**

**شبزندهدار** / šabzendedār ، ـها؛ ـان/: *صفت*. شەونخوون؛ شەوبەیار؛ شەوبێدار؛ خاوەن ئۆگرەتی بە شەوبێداری.

**شبزندهداری** / šabzendedārî ، ـها/: *اسم*. شەونخوونی؛ شەونخووسی؛ شەوبێداری؛ شەوبەیاری؛ دۆخ یان چۆنیەتی شەو بێدارمان، پتر لەگەڵ چالاکیەکی تایبەتدا (وەک کەسێ کە شەو تا بەیانی ناخەوێت و چاوەدێری نەخۆشێکە یان نوێژ دەخوێنێ یان خەریک ڕابواردنە) ‹در اردو کارمان به شبزندهداری میگذشت: لە ئۆردوودا کار و بارمان هەر شەونخوونی بوو›.

**شبستان** / šabestān ، ـها/: *اسم*. ١. شەوسان؛ شەبستان؛ ئەو بەشەی مزگەوت کە سەری گیراوە ٢. *[ادبی]* نووستنگە؛ جێخەو.

**شبغاز** / šabqāz ، ـها/: *اسم*. *[قدیمی]* هەفشی؛ پەچە؛ هەسارگە؛ هەڤێز؛ هەوێز؛ حەوشەمەڕ؛ پەچەمەڕ؛ هەڤش؛ شەوێن؛ کۆتان؛ جێگەی پشوودانی شەوانەی ئاژەڵ لە دەشت.

**شبق** / šabaq/: [معرب از فارسی] ☜ **شَبَه**

**شبکار** / šabkār ، ـها؛ ـان/: *صفت*. شەوکار؛ شەڤکار؛ خاوەن چالاکی پیشەیی لە شەودا ‹پدرم شبکار است و روزها به خانه میآید: بابم شەوکارە و بە ڕۆژ دێتەوە بۆ ماڵ›.

**شبکاری** / šabkārî ، ـها/: *اسم*. شەوکاری؛ شەڤکاری؛ کار و بارێک کە لە کاتی شەودا بەڕێوە دەچێ ‹یک ماه است که شبکاری میکند تا پول بیشتری بگیرد: مانگێکە خەریکی شەوکاریە تا پارەیەکی زۆرتر وەربگرێ›.

**شبکلاه** / šabkolāh ، ـهـا/:اسم. شـەوکـڵاو؛ کلاوێکی پتر نەرمچن و بێلێوارە کە لە ماڵ یان شەوانە کاتی نووستن دەیکەنە سەر.

**شبکور** / šabkûr ، ـها؛ ـان/: صفت. شـەوکوێر؛ شـەوکوور؛ شـەوکوورەک؛ شـەوکۆر؛ شـەوکۆرە؛ ترتـەمیس؛ گـەڕەکوێر؛ شەڤـکۆر؛ تووشـیاری نەخۆشی شەوکوێری.

**شبکوری** / šabkûrî/:اسـم. شـەوکووری؛ شـەوکوێری؛ شەڤـکۆری؛ گـەڕەکوێری؛ لاوازی سۆمای چـاو، لـە شـەو یـان لـە ڕووناکـایی زۆر کەمدا.

**شبکه** / šabake ، ـها/: [عربی]/اسم. تـۆڕ؛ ڕەشـکە: ۱. تۆڕچن؛ پێکهاتەیەک لە هێڵ، شـریت، چێـو یا سـیمی پێـک‌گـەیـشتووی تێکـەڵ ‹شبکەی هواکش: تورچنـی هـەواکێش› ۲. کۆمەڵـێک لـە ئێزگە، هێڵی ڕاگواستنەوە و لقەکانیان ‹شبکەی تلفـن: تـۆری تەلـەفوون› ۳. کۆمەڵـێک لـە دامـەزراوەی سـاناکار یـان ڕاژەگـەلی سـەر بـە ناوچەیـەکی جوگرافیـایی ‹شـبکەی حمـل‌ونقـل؛ شبکەی راههای ارتباطی: توری ڕاگواستن؛ توری ڕێگە و بان› ٤. ڕێکخراوەیێ کە ئەندامەکانی لە تاقم و شوێنی جیاوازدا چالاکیان هەیە ‹شبکەی حزبی؛ شبکەی قاچاق: توری حیزبی؛ توری قاچاخ› ٥. ☜ تور ـ٥

▣ **شبکەی اطلاعاتی**: تۆڕی ئاسایش؛ کۆمەڵـێک ئـامراز و کـەل‌وپـەل و کەسـانێ کـە بـۆ کۆکردنـەوەی زانیـاری کەڵـکیان لـێ وەردەگـیردرێ و زۆرتـر بـۆ ڕێکخـراوەی شۆفاری، دژە شۆفاری و هەواڵـگری ولاتێـک بەکار دێن.

**شبکیه** / šabakîyye ، ـها/: [عربی]/اسم. تۆڕینـەی چاو؛ تۆڕی چاو؛ پۆشەنی نـاوەکی هەسـتیار بـە نووری گۆیچاو، کە لە هەشـت تـوێی لـە سـەر یەک پێک‌هاتووە، حەوتیان دەماریـە و یـەکیان ڕەنگدانەیە.

**شبگرد**[1] / šabgard ، ـها؛ ـان/:اسم. شەڤـڕۆ؛ شـەورۆ؛ چۆکـدار؛ شـەوگەڕ؛ شـەوگەرد؛ جەزایەرچی؛ جەزایرچی؛ چەرخەچی؛ پاسـەوانێ کە شەو لە شـوێنێکدا کێـشک ئـەدا. بەرانبـەر: **روزگرد**

**شبگرد**[2]: صفت. شـەورۆ؛ شـەوگەڕ؛ شـەوگێڵ؛ شەوەڕەو؛ بە تایبەتمەندی لە شەودا گەڕان یـان هەڵسووڕان.

**شبگردی** / šabgardî ، ـهـا/:اسـم. شـەوڕۆیی؛ شەوەڕۆیی؛ شەڤڕۆیی؛ کار و باری شەوڕۆ.

**شبگیر** / šabgîr/:اسم.[ادبی] کـازیوە؛ کـازێوە؛ بەرەبەیان؛ مەلا بانگدان؛ بەیانی زوو.

**شب‌مانده** / šabmānde ، ـها/: صفت. شەومەندە؛ شەومەنە؛ شەومەن؛ شەڤی؛ شەوی؛ پاشماوە لـە شـەوی ڕابـردوو (زۆرتـر سـەبارەت بـە پێخـۆری لێنراوە) ‹یک پیالـه آش شب‌مانده را آورد و گذاشـت جلوی من: پیاڵەیەک چێـشتی شـەومەندەی هێنـا و نایە بەردەمم›.

**شبنامه** / šabnāme ، ـها/:اسم.[قدیمی] شـەونامە؛ بڵاوکراوەیـێ کـە لـە لایـەن تـاقم یـان ڕێکخراوەیەکەوە کە هەڵسووڕانی نهێنیان هەیە، دەردەچێ ‹همه جا شبنامه چسبانده بودند: لە هـەموو شوێنێک شەونامەیان داکوتابوو›.

**شب‌نشینی** / šabnešînî ، ـها/:اسم. شەونـشینی؛ شەوبێری؛ شەڤ‌بۆری؛ شەڤڕۆنک؛ شەڤڕەڤینک؛ شەڤـهەری؛ شـەویاری؛ زیگـار؛ ئـالایش؛ شەومیوانی، چ لە ماڵ یـان شـوێنێکی‌تـر (وەک میوانخانە) کە زۆرتر لەگەڵ مووسیقا، هەڵپەڕکێ و گۆرانیدایە.

**شبنم** / šabnam ، ـهـا/:اسـم. شـەونم؛ شەڤـنم؛ شەڤنەم؛ ئاڤی؛ خنـاف؛ خنـاو؛ خونـاو؛ خونـاڤ؛ ئانگو؛ ئاونگ؛ ئاهنگ؛ خۆ؛ خـۆی؛ خوهـ ؛ ئۆهـ ؛ ڕێل؛ دنگ؛ ئاڵشت؛ ئاڵشتە؛ ئاوشـە؛ قـەراو؛ وردە تنۆکی نمی هەوا کە لە سـەر شـتی سـارد، بـە تایبەت لە شەودا دەنیشێ.

**شبنما**[1] / šabnemā/:*اسم.* شەونما؛ ماکێکی فوسفوری یان شەوڕەنگ کە لە تارماییدا دەدرەوشێتەوە.

**شبنما**[2]: *صفت.* شەونما؛ تێکەڵ بە ماکی فوسفۆر یان شەوڕەنگ ‹ساعت شب‌نما: کاتژمێری شەونما›.

**شبه** / šabah/:*اسم.* *[کانی‌شناسی]* شەڤە؛ شەوڕەنگ؛ شەوگ؛ شەوێ؛ شیا؛ بەردێکی کانگایی لە جۆری لیگنیتی ڕەق، ڕەش و بریقەدار کە هێلەساو دەدرێ و لە گەوهەرسازیدا بە کەڵک‌دێ: **شبق**

**ـــ شبه** / šabe/: *پیواژە.* ـــ شەوە: ١. شەو؛ پێوەندیدار بە ژمارەی شەوان و هەروەها پێوەندیدار بە مەودای کاتی بە پێی شەو ‹همه‌شبه؛ هرشبه؛ هەمووشەو؛ هەرشەو› ٢. خاوەن تەمەن بە پێ شەو ‹سی‌شبه؛ یک‌شبه: سی‌شەوە؛ یەک‌شەوە›.

**شبهـ** / šebh/: [عربی] *پیشواژە.* وەکـــ ؛ ـــئاسا؛ سا؛ وەکیـ ؛ وەکەـ ‹شبه‌انسان: وەک‌مرۆ›.

▣ **شبه پول:** پارەئاسا؛ ئەو مالانەی بە پێی دراو بایەخیان دیاری دەکرێ و بە ئاسانی دەبنە دراو، بەلام خۆیان دراو نین (وەک بەڵگە بەنرخەکان، بەڵگە قەرزیە دەوڵەتیەکان).

**شبه جزیره:***[زمین‌شناسی]* نیودورگە؛ گراڤە؛ نیمچە جزیرگە؛ کەرکە؛ جزیرە ئاسا؛ کەرگراف؛ نیمچەدورگە؛ زەوینێک سێ لای ئاو بێ و لایێکی وشکانی (وەک نیو دورگەی عەرەبستان).

**شبه جمله:***[دستور]* کلۆز؛ ڕستەتا؛ ڕستەئاسا؛ ڕستەیەکی بەبێ‌کردار کە نیشانەی دۆخێکی عاتیفی وەک ئافەرین، سەرسوورمان، شادی و داخ و وەک ئەوانەیە (وەکوو خۆزگە؛ داخەکەم).

**شبه حصبه:** ساگرانەتا؛ جۆرێ تەوی ڕیخۆڵە کە سەختی و ماوەکەی کەمتر لە گرانەتایە.

**شبه رسمی:** سامیری؛ نیوەدەوڵەتی؛ دەزگایەک یان ڕێوشوێنێک کە پەیوەندی دەگەڵ دەوڵەت هەیە و تەواویش دەوڵەتی نیە.

**شبه فلز:** ١.*[شیمی]* نیوچەکانزا؛ نیمچەکانزا؛ توخمێک بە تایبەتمەندی فیزیکی کانزا و تایبەتمەندی کیمیاوی ناکانزاوە ٢.*[مجازی]* ناکانزا.

**شبه قاره:** ١. نیوچەبەژەک؛ سابەژەک؛ کۆما وشکانیەکی گەورە (وەکوو گرۆئەنلەند) کە بەرینایی لە بەژە ئاساییەکان کەمترە ٢. بەشێکی بەربلاوی جیاواز یان دیاریکراو لە بەژەکێکدا ‹شبه قارەی هند: نیوچەبەژەکی هیند›.

**شبه وبا:** وبای التور ☜ **وبا**

**شبهات** / šobahāt/: [عربی] جمع ☜ **شبهه**

**شبهه** / šobhe ، ـها؛ شبهات/: [عربی]*اسم.* گومان؛ دوودڵی؛ سۆ؛ دلاودلی؛ دڕدونگی؛ دۆخ یان چۆنیەتیەک کە ببێتە هۆی شک یان دوودڵی لەمەڕ ڕاست یان درۆ، دروست یان هەڵە، چاک یان خراپ بوونی شتێکەوە ‹حرفهای تو این شبهه را ایجاد می‌کند که کار ما درست نبوده است: وتەکانت ئەم گومانە دینێ کە کارەکەمان درووس نەبووە›.

**شبی** / šabî/: *قید.* شەوێک؛ شەوێ؛ شەوێوە؛ شەویە؛ بە شەوێک: ١. لە هەر شەوێکدا ‹شبی دو ساعت کتاب می‌خواند: شەویک دوو ساعەت کتێب دەخوێنێتەوە› ٢. لە درێژایی شەوێکدا ‹شبی هشت ساعت می‌خوابد: شەویک هەشت ساعەت دەخەوێ›.

**شبیخون** / šabîxûn ، ـها/:*اسم.* شەوخوونی؛ شەڤخوونی؛ شەووەخوون؛ شەبیخوون؛ شەوخی؛ چەیخوون؛ شەویۆڵغار؛ دابەڕزانی شەوانە بۆ سەر دوژمن ‹ساعت یک بامداد با شبیخون به دشمن آنها را غافلگیر کردند: کاتژمێر یەکی بەیانی بە شەوخوونی کە دایان بە سەر دوژمندا شەوهاندنیان›. هەروەها: **شبیخون زدن**

**شبیه** / šabîh/: [عربی] *صفت.* هاووێنە؛ هاوچەشن؛ وەکوو یەک؛ لە یەک چوو؛ هەڤرات؛ تەچ؛ زاناف؛ وەک‌یەک؛ وێنەی یەک؛ پێسەو یۆی؛ بە ڕواڵەت وەک یەک و لە بنەمادا جیاواز ‹بچەها بە قدری شبیه بودند کە همیشە آنها را عوضی می‌گرفتم: منداڵەکان هێندە هاووێنە بوون کە هەمیشە لێم دەگۆڕان›.

**شبیه‌خوانی** / šabîhxānî/: [عربی/ فارسی] ☜ **تعزیه‌خوانی**

**شبیه‌سازی** / šabîhsāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /*اسم.* منیاک‌سازی؛ هاوشێوەسازی؛ کار، ڕەوت یان پیشەی دروست‌کردنی وەک یەک: *الف)* بەرهەمێکی پیشەیی *ب)* شێوەکاری دەزگایەک بە کەمپیوتەر.

**شبیه‌گردان** / šabîhgardān/: [عربی/ فارسی] ☜ **تعزیه‌گردان۱**

**شپش** / šepeš ، ـها/: /*اسم.* سپێ؛ هەسپێ؛ ئەسپێ؛ هەپش؛ هەپشێ؛ ئەسپشێ؛ هسپی؛ سپپی؛ سپە؛ هەشپش؛ هەشپشێ؛ هەشپشی؛ گنار؛ مێروویەکی چکۆلەیە کە ڕەشی لە قژدا و سپیەکەی لە تۆی جل‌وبەرگدا گەرا دەکا و گەورەکانیان نەخۆشی بڵاو دەکەنەوە.

▣ **شپش مرغ:** پند؛ کەپلە؛ ئەسپێی مریشک.

▣ **شپش گذاشتن:** سپێ تێیدان؛ سپێ لێدان؛ سپێ نانەوە؛ هەشپشێ هۆرئاردەی ‹سرش شپش گذاشتە بود: سەری سپی تێیدابوو›.

**شپشک** / šepešak ، ـها/: /*اسم.* مێروویەکی ورد و بێباڵی ڕەنگ ڕەشە کە ملۆزمی دار و گیایە: **شپشە**

**شپشو** / šepešû ، ـها/: *صفت.* [*گفتاری*] ۱. ئەسپێون؛ سپێون؛ ڕشکن؛ ڕشکاوی؛ ڕشکۆ ۲. [*مجازی*] چلکن؛ چەلکن؛ قیزەون؛ گەمار؛ دزۆێن.

**شپشە** / šepeše/ ☜ **شپشک**

**شتاب** / šetāb ، ـها/: /*اسم.* لەز؛ پەلە؛ هەشتاو؛ هەتاو؛ بریو؛ پو؛ لەپە؛ پەڵە؛ لەزاهی: ۱. سەرپێ؛ هەلپ؛ هەڵپە؛ زوو؛ زوی؛ تەڵووکە؛ تاڵووکە؛ ساتی؛ دەف؛ دەواڵ؛ کار یان ڕەوتی ئەنجامدانی کارێک لە کاتێکی کەمتر یان بە خێرایەکی زۆرترەوە ۲. خێرایی؛ توندی؛ گورجی؛ کوڵووکی ۳. [*مکانیک*] چەندێتی ئاڵوگۆڕی خێرایی بە پێی کات (سانتی‌میتر لە چرکەدا).

▣ **شتاب دادن:** هەشتاو پێدان؛ پاڵ پێوە نان؛ زۆرکردنی خێرایی ‹باید بە کارها شتاب بیشتری داد: دەبێ هەشتاوی زۆرتر بدرێ بە کارەکان›.

**شتاب داشتن:** ۱. بەتاو بوون؛ بەلەز بوون؛ دەور فرە بوون ‹موتور شتاب زیادی داشت: موتورەکە زۆر بەلەز بوو› ۲. بە پەلە بوون؛ بێ‌تەشە بوون؛ بە هەڵەداو بوون؛ پەل و پۆ بوون ‹شتاب داشت خود را بە دوستانش برساند: بە پەلە بوو خۆی بگەیێنێتە هەوالانی›.

**شتاب کردن:** پەلەکردن؛ لەزکرن؛ بەلەسە بوون؛ وە پەلە کەوتن ‹برای رسیدن بە خانە شتاب می‌کرد: بۆ گەییشتنە ماڵەوە پەلەی دەکرد›.

**شتاب گرفتن:** دەور هەڵگرتن؛ دەور گرتن؛ هەشتاوگرتن؛ ئامەیەوە باڵێ ‹موتور شتاب گرفت: موتورەکە دەوری هەڵگرت›.

**شتابان** / šetābān/: *قید.* بەپەلە؛ لەز و بەز؛ بە پەلە؛ بەلەز؛ بە هەتاو؛ بە خێرایی؛ لەزالەز؛ لەزگین؛ پەلەپاتۆر؛ بەل؛ لەزکانی؛ تێزە ـ تێزە؛ بریو ـ بریو؛ ئازا ـ ئازا؛ زوو ـ زوو؛ هەلات ـ هەلات؛ بە هەڵەداوان؛ پەلەوداوان؛ هەشتاوان ‹شتابان می‌رفت: بەپەلە دەڕۆیشت›.

**شتاباندن** / šetābāndan/: *مصدر. متعدی.* // **شتاباندی:** تاوتدا؛ **می‌شتابانی:** تاوەدەدەی؛ **بشتابان:** تاو دە// تاو پێدان؛ هنجراندن؛ پرتافاندن؛ پرتافانن: ۱. گوڕی شتێک زۆرکردن ۲. دەور پێدان؛ خێراکردن. هەروەها: **شتاباندنی**

■ صفت فاعلی: **شتابانده** (تاودەر)/ صفت مفعولی: **شتابانده** (تاودراو)

**شتابدار** / šetābdār/: *صفت.* بەتاو؛ بەلەز؛ لەزەی.

**شتابزدگی** / šetābzadegî ، ـها/: *اسم.* پەلەپەرتکێ؛ هەڵەداوی؛ هەڵپە؛ تەنگەتاوی؛ بەلەزی؛ پەلەپرووزەیی؛ پەلەپرووزکێ؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەلەز بوون ‹با شتابزدگی خود را به اتاق رساند: بە پەلەپرتکێ خۆی گەیاندە هۆدەکەوە›.

**شتابزده:** *قید.* بە پەلە؛ بە هەڵپە؛ بەلەز؛ گورج؛ گورجێ ‹شتابزده گفت: من خبر ندارم: بە پەلە گوتی: من ئاگام نیە›.

**شتابسنج** / šetābsanc ، ـها/: *اسم.* لەزپێو؛ کەرەسەیەک بۆ ئەندازەگرتنی لەز یان دۆزینەوە و ئەندازەگرتنی لەرە.

**شتابناک** / šetābnāk/: *صفت. [ادبی]* بە پەلە؛ خێرا؛ بە هەڵەداوان؛ بە هەشتاو؛ بە خێرایی زۆرەوە.

**شتابنده** / šetābande ، ـگان/: *صفت.* خێرا؛ گورج؛ گورج و گۆڵ؛ خاوەن خێرایی.

**شتابیدن** / šetābîdan/ ☜ **شتافتن**

**شتافتن** / šetāftan/: *مصدر. لازم.* // **شتافتی:** غارتدا؛ **می‌شتابی:** غار دەدەی؛ **بشتاب:** غاردە// غاردان؛ لەزین؛ لەپین؛ لەزیان؛ هنجران: ۱. دەرچوون؛ ڕاکردن؛ پەکین؛ بەرشیەی؛ بە خێرایی زۆرەوە ڕۆیشتن ‹گویی زمان چون باد می‌شتافت: چما کات وەک با دەلەزی› ۲. تێ‌تەقاندن؛ پەلەکردن؛ لەزکرن؛ پڕتافیان؛ پڕتافان؛ پەلەکەردەی؛ بە پەلە بۆ لایەک ڕۆیشتن ‹به خانه شتافت: بەرەو ماڵ تیی تەقاند› ❋ **شتابیدن.** هەروەها: **شتافتنی**

■ صفت فاعلی: **شتابنده** (غاردەر)/ صفت مفعولی: **شتافته** (غاردراو)/ مصدر منفی: **نشتافتن** (غارنەدان)

**شتالنگ** / šetālang/: *اسم.* کاب؛ قاپ؛ میچ؛ جگ؛ جک؛ چوو؛ کاپ؛ ماچ؛ دەقاق؛ پێشەی پاشنەی پێ.

**شتر** / šotor ، ـها؛ ـان/: *اسم.* وشتر؛ شوتر؛ حوشتر؛ هێشتر؛ هەشتر؛ حێشتر؛ وەشتر؛ هۆشتر؛ هوشتر؛ ئشتر؛ سار؛ سال؛ دەڤە؛ دەڤەهـ ؛ دەوەهـ ؛ ئارڤانە؛ گیانەوەرێکی گواندار لە تیرەی وشتران، بە ڕەنگی شەکەری ئامال خورمایی ڕەش، سەری بچووک، ملی بەرز و گوێی بچکۆلەوە، بۆ بار بردن، گۆشت، چەرم، خوری و تەنانەت شیریش ڕایدەگرن: **اُشتُر** *[ادبی]*

⊡ **شتر بی‌کوهان:** لاما؛ وشترێکی ئامریکاییە.

**شتر عصّارخانه:** *[کنایی]* گای بنە؛ ئەوەی کە هەوڵ و تەقالای بێ‌هۆ دەدا.

**شتر لوک:** *[کنایی]* لۆق؛ حووج؛ حۆل؛ درێژ تا ئێوارە؛ کەسێ کە لەڕ و لاواز و درێژ و ناحەزە.

**شتر نقاره‌خانه:** *[مجازی]* ئەوەی کە لە هەڕەشە و گوڕەشە ناترسێ.

⊡ **شتر با بارش گم شدن:** *[مجازی]* کەر بە بارەوە نوقم بوون؛ ماهەرە چنەگمە بیەی؛ شوێنێ زۆر ژلۆق-پلۆق و هەڵپرژاو بوون ‹توی این خانه شتر با بارش گم می‌شود: لەم ماڵەدا کەر بە بارەوە نوقم دەبی›.

**شتر در خانه‌ی کسی خوابیدن:** *[کنایی]* ئەمڕۆ لە من و سبەی لە تۆ بوون؛ نۆرەی زەحمەت و دژواری بە کەسێ گەیشتن.

**شتر را با ملاقه آب دادن:** *[کنایی]* وشتر بە قاپۆلە بەڕوو ئاودان؛ ئامرازی نالەبار بۆ کارێک بە کار بردن.

**شتر را با نمد داغ کردن:** *[کنایی]* هێلکە لە قەل دزین؛ بە ئاو هێلکە و ڕۆن دروستکردن؛ لە ئاو کەرە گرتن؛ لە سەر ئاو ئاگرکردنەوە؛ دەرزی لە چاو مار دەرهێنان؛ یەکجار زرینگ و فێڵباز بوون ‹اینها شتر را با نمد داغ می‌کنند: ئەمانە هێلکە لە قەل ئەدزن›.

**شتربان** / šotorbān ، ـها؛ ـان/: *اسم.* وشترەوان؛ شوترەوان؛ ئارڤانەبان؛ سالوان؛ سارەوان؛ هێشترڤان؛ حوشترەوان؛ هەشترچی؛ وشترچی؛

ئەو کەسە چاودێری وشترانە، بەتایبەت ئەوەی کە باریان پێدەکێشێ.

**شترخار** / šotorxār/ ☜ **خارشتر**

**شترخان** / šotorxān، ـها/: *اسم*. وشترخان؛ شوێنی پاراستنی وشتران.

**شترسواری** /šotorsavārî/: *اسم*. وشترسواری؛ هێشترسواری؛ کاری سوار بوون لە سەر پشتی وشتر.

▣ **شترسواری دولا دولا**: *[کنایی]* شاردنەوەی نابەجێ و ناشیانە.

**شترق** / šataraq/: *صوت*. شریخە؛ شەقە؛ شەق؛ دەنگی بەرز و لەنەکاوی شکانی شتێک (وەک چێو)، یان دەنگی تەقانی گولە.

**شترگاوپلنگ** / šotorgāvpalang/: *اسم*. وشترگا؛ هێشترگا؛ زەڕافە؛ وشترپڵنگ؛ وشتربەڵەک.

**شترگربه** / šotorgorbe/: *اسم.[کنایی]* ورچ و عەبا؛ کەر و کوڵەنجە؛ هەشە و کوڵنجە؛ کەرگە و پرچکە؛ هەر شتێکی دزێو و نالەبار.

**شترگلو** / šotorgalû، ـها/: *اسم*. سیفۆن؛ وشترگەڵوو؛ لوولەیەکی چەماوە کە لە ژێر کاسەی مەستراو و ڕەهەندا دایدەنێن.

**شترمآب** / šotorma'āb/: [فارسی/ عربی] *صفت*. *[کنایی]* لووتبەرز؛ فیزن؛ بەدەمار؛ نەسەقزل؛ ترزل؛ خاوەن ئاکارێکی وشک، ڕەسمی و بە دەعیە و دەمارەوە ‹شریکش خیلی شترمآب تشریف دارد: شەریکەکەی زۆر لووتبەرز دەنوێنێ›. هەروەها: **شترمآبی**

**شترمرغ** / šotormorq، ـها؛ ـان/: *اسم*. وشترمر؛ هەشترمە؛ ئاگرخۆرە؛ حوشترمەل؛ حوشترمرخ؛ وشترمریشک؛ کەردیکل؛ پەلەوەرێکی نەفڕ، بە سەر و مل و ڕانی بێپەڕ یان کەمپەڕ، ڕەنگی ڕەش و بریقەدار، کلک و سەربالی سپیەوە کە ماکانیان قاوەیی ئامال خۆڵەمێشیەو بەرزی برێ لە نێرەکانیان دەگاتە ۲٫۵ میتر.

▣ **شترمرغ استرالیایی**: پەلەوەری لێرەواری بە بەرزی زۆرتر لە ۱۵۰ سانتیمیتر و سەر و مل بێپەڕ و تانجیکی وەک کڵاو خوودەوە کە شەوان دەگەڕێ: **کامۆواری؛ بزمرغ**

**شترنج** / šatranc/: [از سنسکریتی] ☜ **شطرنج**

**شتره** / šatare/: *صفت.[گفتاری]* شپرز؛ شەلەختە؛ شپرزە؛ شپرێو؛ پەرژ و بلاو؛ ڕیپاڵ.

**شتری**[1] / šotorî/: *اسم*. وشتری؛ هێشتری؛ قاوەیی کاڵ؛ ڕەنگی قاوەیی کاڵ. هەروەها: **شتری‌رنگ**

**شتری**[2]: *صفت*. وشتری؛ حوشتری؛ هێشتری: ۱. قاوەیی کاڵ؛ بە ڕەنگی قاوەیی کاڵ ۲. پێوەندیدار یان سەر بە وشترەوە ‹رقص شتری: هەڵپەڕکێی وشتری›.

**شتک** / šatak/: *اسم*. پرشە؛ پرژە؛ پەڕوشک؛ پریشک؛ پژگە؛ تنۆکی تراو (بەتایبەت تراوی خەست یان پیس) کە بەبێ ویست بپرژێت.

▣ **شتک زدن**: پژان؛ پرژان؛ پرژانی دڵۆپگەلی تراوێک ‹خون به دیوار شتک زده و خشکیده بود: خوێن پژابوو بە دیواردا و وشک هەڵاتبوو›.

**شتل** / šetel/: *اسم*. ۱. تەڵەکە؛ پارەیەک کە قومارخانەدار لە قوماربازانی دەستێنێ ۲. دەسخۆشانە؛ پارەیەک بە ناو شادیانە کە لە قوماربازی بەرەندەی دەستێنن * **شتیلی**

**شتم** / šatm، ـها/: [عربی] *اسم.[ادبی]* جنێو؛ جوێن؛ خۆسن؛ خوەسن؛ دژمان؛ دژوێن؛ دژمانی؛ دووژن؛ ناتۆر.

**شته** / šate، ـها/: *اسم*. شەقی؛ شەتە؛ ترتول؛ شۆبە؛ شۆکە؛ شۆک؛ مێرووبەکی وردی ڕەشە بە گەزۆی دارەوە دەنیشێ و خەساری دەکا.

▣ **شتەی پالیزی**: گەزۆکی؛ دۆکەی پەلکی بیستان.

**شتەی نباتات**: گەز؛ شۆکەی دار و درەخت.

**شتیلی** / šitîlî/ ☜ **شتِل**

**شجاع** / šocā'، ـان/: [عربی] *صفت*. دلێر؛ بوێر؛ ئازا؛ ورەدار؛ مێر؛ مێرخاس؛ مەرخوز؛ بەجەرگ؛

یەمان؛ نەترس؛ نەتەرس؛ زیخ؛ زەنەقدار؛ هۆل؛ هۆول؛ زاتدار؛ بەزات؛ دڵشێر؛ وێر؛ وەند؛ قادڤین؛ هەوێرا؛ وێرا؛ عەگیت؛ عەگید؛ عەگن؛ جوامێر؛ جامێر؛ جندی؛ بەکار؛ گەڕناس؛ گەڕنووس؛ سەندەر؛ کوڕ؛ دڵشوور؛ وەکار؛ جەرگ‌قایم؛ قەرتەمێر؛ فێرز؛ فێرس؛ پڕدڵ ‹سرباز شجاع؛ مرد شجاع: سەربازی دلێر؛ پیاوی بوێر›.

**شجاعانه**[1] / šocā'āne/: [عربی/ فارسی] *صفت*. ئازایانە؛ ئازانە؛ کەلانە؛ وەندانە؛ بوێرانە؛ دلێرانە؛ مێرەکی؛ مێرانە ‹دفاع شجاعانه؛ مقاومت شجاعانه: بەرگری ئازایانە؛ خۆڕاگری ئازایانە›.

**شجاعانه**[2]: *قید*. بوێرانە؛ ئازایانە؛ کەلانە؛ وەندانە؛ هاوڕێ دەگەڵ بوێریدا ‹او شجاعانه جنگید: ئازایانە شەڕی کرد›.

**شجاعت** / šocā'at ، ـها/: [عربی] *اسم*. دلێری؛ بوێری؛ ئازایەتی؛ ئازایی؛ وێرایی؛ ورار؛ زراو؛ هەناو؛ ورە؛ زەهلە؛ زەندەک؛ زەنەق؛ زەندەق؛ مێرانی؛ هەوێری؛ هێور؛ هەوتانایش؛ هورە؛ مێرخاسی؛ گەڕناسی؛ هەیهێز؛ هەترەش؛ نەترە؛ هەترە؛ چاوسووری؛ نەترسی.

**شجره** / šacare ، ـها/: [عربی] *اسم*. ڕەگەز؛ ڕەچەڵەک؛ بنەچەک؛ بنەچە؛ بنەچەکە؛ نوانەیێ کە پێوەندی بنەماڵەیی کەسان یان گرۆیی گیانەوەران یان گیاگەل پێکەوە نیشان دەدا.

**شجره‌نامه** / šacarenāme ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. ڕەگەزنامە؛ شەجەرە؛ سەجەرە؛ نووسراوەیێ کە پەیوەندی کەسێک لەگەڵ پێشینانی، یان کەس و کاری خانەدانی و خزمایەتی نێوانیانی تێدا نووسراوە و گەلەک جاریش بە شێوەی نوانە نیشان دەدرێ.

**شجری** / šacarî/: [عربی] *صفت*. دارئاسا؛ وەکوو درەخت؛ پەل- پەل.

**شخار** / šaxār/: [آرامی] *اسم*. شەخار؛ خۆڵەمێشی گیاگەلی وشکارۆ کە لە سابوونسازیدا کەڵکی هەیە: **شغار**

**شخانک** / šaxānak ، ـها/: *اسم*. شۆلە؛ شەهاب.

**شخانه** / šaxāne ، ـها/: *اسم*. بەردی ئاسمانی؛ بەردێ کە لە بۆشایی نێوان گەڕۆکانی ئاسمانیەوە بەرەو زەوی دێ: **سنگ آسمانی**

**شخص** / šaxs ، ـها؛ اشخاص/: [عربی] *اسم*. کەس: ۱. مرۆ؛ کێس ‹هر شخص حق دارد آزاد زندگی کند: هەر کەسێ مافی هەیە ئازاد بژیت› ۲. کێس؛ خۆ؛ خودی مرۆ ‹پول به شخص او تحویل شد: پارەکە درا بە خودی کەسەکە› ۳. */حقوق/* تاک؛ ئەوەی کە مافی هەیە و ئەرکی لە سەر شانە ‹شخص حقیقی؛ شخص حقوقی: کەسی ڕاستەقانی؛ کەسی حوقۆقی›.

▣ **شخص ثالث**: */حقوق/* سێهەم کەس؛ کەسێکی سێهەم کە لە پێوەندی نێوان دوو کەسدا دێتە ئاراوە ‹بیمەی شخص ثالث، یعنی بیمەی شخص یا اتومبیلی جز راننده و اتومبیل بیمه شونده: دابینی سێهەم کەس، یانێ دابین‌کردنی کەس یان ماشینێک بێجگە لە ئاژوان و ماشینی دابین‌کراو›.

**شخص حقوقی**: */حقوق/* بنکە یان نووسینگەیێ کە قانوون بە ڕەسمی ناسیویە (وەکوو بەشدارگەی بازرگانی).

**شخص حقیقی**: کەس؛ ئەو کەسە کە هەیە.

**شخصاً** / šaxsan/: [عربی] *قید*. بۆ خۆ؛ خۆ؛ وێ؛ لە لایەن خودی کەسەوە ‹شخصاً او را نمی‌شناسم، اما با برادرم دوست است: بۆ خۆم نایناسم، بەڵام لەگەڵ براکەمدا دۆستە›.

**شخصی** / šaxsî/: [عربی] *صفت*. ۱. کەسی؛ کەسین؛ خۆیی؛ پێوەندیدار بە مرۆوە ‹وظایف شخصی؛ حقوق شخصی: ئەرکی کەسی؛ مافی کەسی› ۲. /ـها/ کەسی؛ خۆیی؛ پێوەندیدار بە کەسانێکەوە ‹اتومبیل شخصی: ماشینی کەسی›. بەرانبەر: **جمعی؛ همگانی؛ عمومی** ۳. /ـها/ شەخسی؛ بەرانبەری نیزامی ‹لباس شخصی: جل‌وبەرگی شەخسی›.

**شخصیت** / šaxsîyyat/: [عربی] *اسم*. کەسایەتی؛

کەسیەتی: ١. گەد، ڕەوشت یان چۆنیەتیەک کە دەبێتە هۆی کەوتنە بەر چاو و بایەخی کەسێک لە لایەن خەڵکەوە ‹فرد با شخصیتی بود: مرۆیەکی کەسایەتی‌دار بوو› ٢. کۆی دانستەگەلی هەر کەسێ کە لە کەسانێکیتر جیای دەکاتەوە ‹شخصیت وسواسی: کەسایەتی وەسواسی› ٣. /ـها/ /حقوق/ دۆخی هەبوونی قانوونی ‹شخصیت حقوقی: کەسایەتی حوقوقی› ٤. /ـها/ هەر یەکە لە قارەمانگەلی فیلم، چیرۆک یان شانۆیەک ‹شخصیت اصلی؛ شخصیت بد: کەسایەتی سەرەکی؛ کەسایەتی خراپ›: **پرسۆناژ**

▣ **شخصیت حقوقی**: /حقوق/ کەسایەتی حوقوقی؛ ڕێکخراوە، بنکە یان کۆمەڵێ کە لە بواری قانوونییەوە هەبوونی سەلماوە و ماف و بەرپرسایەتی هەیە.

**شخصیت حقیقی**: /حقوق/ کەسایەتی ڕاستەقینە؛ کەسێ کە هەیە و هەبوونێکی خەیاڵی یا گریمانەیی نیە.

**شخصیت‌پردازی** / šaxsîyyatpardāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. کار یان ڕەوتی ناساندنی کەسایەتی لە چیرۆک، شانۆ یان فیلمدا لە ڕێگای نیشان‌دانی تایبەتمەندی بەدەنی، وتەیی، هزری و ئاکاریەوە.

**شخصی‌ساز** / šaxsîsāz ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت*. خۆخوتی؛ درووستکراو (زۆرتر خانوو) بۆ کەڵک لێوەرگرتنی کەسێکی تایبەت و نە وەک بۆ فرۆش.

**شخم** / šoxm/: *اسم*. شێو؛ شێف؛ شوو؛ شۆ؛ شۆم؛ شوەم؛ کاش: ١. /ـها/ هێڵ؛ کێڵ؛ هێڵگەلێ کە دە ڕووی زەویدا هەڵدەکەنرێن ٢. هێتە؛ شوو؛ شێوەرد؛ وەرد؛ خەپر؛ گایار؛ جووت؛ جۆت؛ جفت؛ کار یان ڕەوتی شێف بڕینی زەوی بۆ چاندن.

▣ **شخم زدن**: کێلان؛ کاڵین؛ کاڵیان؛ کاڵەی؛ کالای؛ هێڵ‌دان؛ کاش کردن؛ جفت کردن؛ هیت‌کەردەی؛ خەپراندن؛ شووم بڕین؛ شێف بڕین؛ شۆ بڕیەی؛ وەرد بڕین؛ جووت‌کردن؛ خەت دان؛ هێڵ‌هێڵ هەڵکەندنی ڕووی زەوی بۆ کشت و کاڵ. هەروەها: **شخم خوردن**

**شخیص** / šaxîs/: [عربی] *صفت*. مەزن؛ مازن؛ گراگر؛ گرگر؛ هێژا ‹شخص شخیص: مرۆی مەزن›.

**شدامد** / šodāmad/: *اسم*. هات‌وچۆ؛ هات‌وچوو؛ ئام‌وشۆ؛ ئامەولوەی: ١. ترافیک؛ گەڕ و خولی ئامێرگەلی گواستنەوە ٢. جەنجاڵی؛ چڕوپڕی لە هات‌وچوودا.

**شداید** / šadāyed/: [عربی] *اسم*. /ادبی/ دژواری؛ تووشی؛ گرفتگ؛ گرانی؛ سەختی؛ سەخڵەتی؛ چەتوونی؛ چورتمە؛ تەنگی و چەڵمە ‹تحمل شداید را نداشت: بەرگەی دژواری نەدەگرت›.

**شدت** / šeddat/: [عربی] *اسم*. توندی؛ زۆری؛ گوژم: ١. هێز؛ زەبر ‹از شدت ضربه بیهوش شدم: لەبەر گوژمی لێدانەکە بوورامەوە› ٢. زیادی؛ فرەیی؛ فرەهی؛ کەلنایا؛ کوڵەکوڵ؛ سرتی (بەتایبەت لە باری هێز یان گوشارەوە) ‹شدت روشنایی: زۆری ڕووناکی›.

▣ **شدت گرما**: گەرماهی؛ تین؛ تەوژمی گەرما؛ کەلیلان؛ کڵ؛ کوڵەکوڵی گەرما؛ تاو؛ گەرمەوەزە؛ تاو و تینی گەرما.

▣ **شدت گرفتن / یافتن**: تاو سەندن؛ توند بوونەوە؛ زۆرگرتن؛ سەخت یان زۆرتر بوونەوەی گوشاری شتێک.

**شدکار** / šedkār/ ☜ **شدیار**

**شدن** / šodan/: *مصدر. لازم*. //**شدی**: بووی؛ **می‌شوی**: دەبی؛ **بشو**: ببە// ١. بوون؛ بیەی؛ بین؛ بە بار و دۆخێک دەرهاتن ‹بزرگ شدن: گەورە بوون› ٢. ڕوودان؛ بیەی ‹جنگ شدن؛ شب شدن: شەڕ بوون؛ بوونە شەو› ٣. /گفتاری/ شیان؛ شیەی؛ شیای؛ شیاو بوون؛ لە باو بوون ‹نه لباس به تنش می‌شد و نه کفش به پایش: نە جل بە بەری دەبوو نە

پـێلاو بـە پـای› ٤. کـران، بارهـاتن؛ دەسـدان؛ ڕەخـسان؛ ڕخـسان؛ لـوان؛ لێویـەی؛ بیـەی؛ ڕێ کەوتن ‹نشد که برویم: نەکرا بـڕۆین› ٥. *[ادبی]* چوون؛ ڕۆیشتن؛ شیەی؛ شیای؛ لـوەی؛ لـوای ‹آمدوشد: هاتوچوو› ٦. تێپەڕین؛ بوورین؛ بۆرین؛ بووردن؛ تێپـەڕ بـوون؛ بـە سـەرچوون؛ ڕابـردن؛ ویەردەی؛ شـیەی ‹روزگـارم شـد بـه نـادانی: ژیـنم تێپەڕیێ بە نەزانی›.

■ صفت فاعلی: **شونده** (ـ)/ صفت مفعولی: **شـده** (بووگ)/ مصدر منفی: **نشدن** (نەبوون)

**شـدنی** / šodanî/: *صـفت. [گفتـاری]* بووزخـۆر؛ بەتایبەتمەندی ئەگەری ڕوودان ‹رییس گفت: این کار شدنی نیست و برایم مسئولیت دارد: بەرپرس گوتی: ئەم کارە بووزخور نابێ و بۆم بەرپرسایەتی هەیە›.

**شده** / šadde/: [عربی] *اسم.* ١. شـەدە؛ مـشکی؛ قوماشێکی دەستچنی ئاوریـشمی گولـەنگدارە کە لە برێ ناوچەدا وەک سەرپێچ یـان پـشتێن دەیبەستن ٢. *[قدیمی]* ملوانکە؛ ملوانک؛ مووروو؛ مـــوورگ؛ ڕیزێکـــی مـــرواری (یـــان بـــەردە بایەخـداره‌کانی‌تـر) کـە لـە دەور سـەر و ملـدا هەڵیاندەواسی.

**شدیار** / šedyār/: *اسم.* جـاڕ؛ پـەرێز؛ کێـڵگەی دروا‌و: **شِدکار**

**شدید** / šadîd/: [عربی] *صفت.* تونـد؛ تـون؛ تـن: ١. گومڕە؛ سەخت؛ دژوار؛ بە تەوژم؛ بـەهێز؛ بـە زەحمەت ‹ضربەی شدید؛ بیماری شدید: لێدانی توند؛ نەخۆشینی سەخت› ٢. بـەتاو؛ بـەتین؛ تیـژ؛ تێـژ ‹باران شدید؛ محبت شدید: بارانی بەتاو؛ خۆشەویستی بەتین›.

▣ **شدید بودن:** توند بوون؛ بـە تـین/ تـاو بـوون ‹باران شدید بود: باران توند بوو›.

**شـدید شـدن:** تـاو سـەندن؛ زۆرگـرتن؛ تـین گێرتەی ‹بعداً شدید شد: دوایی تاوی سەند›.

**شدیداً** / šadîdan/: [عربی] *قید.* بـە تونـدی؛ بـە تونی؛ بە سەختی ‹روزنامەها شدیداً به شهردار حمله کردند: ڕۆژنامەکان بە تونـدی شـاڵاویان کـردە سـەر شارەدار›.

**شـدیداللحن** / šadîdollahn/: [عربـی] *صـفت.* خاوەن وتەی توند و تاڵ.

**شـر**[1] / šar(r)/: [عربـی] *اسـم.* شـەڕ: ١. خراپـی؛ بەدی؛ خراوی ٢. *[گفتاری]* ئاژاوە؛ گاشە؛ بشێوە.

▣ **شـر پیـا کردن:** شـەڕ هەڵگرسـاندن؛ شـەڕ ڕێخـستن؛ ئـاژاوە نانـەوە؛ شـەڕ نانـەوە؛ ئاژاوەگێڕان؛ ئاژاولێ وەش‌کەردەی.

**شر چیزی/ کسی را کندن:** شتێ/ کەسێک لـە مل/ کـۆڵ کردنـەوە/ خستنەوە؛ ڕزگـار یـان ئاسوودە بوون، بـە هـۆی لـە نێـو بـردن یـان دوورکردنەوەی شتێ یان کەسێک.

**از شر چیـزی/ کـسی خـلاص شـدن:** شـتێک/ کەسێک لە کۆڵ بوونەوە؛ لـە مـل بوونـەوەی کەسێ یان شتێک ‹طـلاق گرفـت و از شـر مـادر شوهرش خلاص شد: تەلاقی سەند و خەسووی لـە کولی بووەوە›. هەروەها: **از شر کـسی/ چیـزی خلاص کردن**

**شر**[2]: *صـفت. [گفتـاری]* شـەڕ؛ ئـاژاوەچی؛ گۆتـاڵ؛ ئاژاوەگێـــڕ؛ بـــشێوە؛ شـــێوەژنە؛ شـــێوێن؛ سەرەسوێدەرە؛ جـووت‌قۆشـە؛ کێشەهەڵایـسێن؛ شەڕ هەڵایسێن؛ هۆی زەحمەت و ئارێشە ‹او آدم شری بود و هر جا می‌رفت مـردم را بـه سـتوه مـی‌آورد: مرۆڤێکی شەڕ بوو، بۆ هەر کوێ دەڕۆیشت خەڵـکی وەزاڵە دەهێنا›.

**شر** / šer/: *اسم. [گفتاری]* شـڕە؛ بزگـوڕ؛ ڕینـدۆڵ؛ تیتۆڵ؛ بەرگ یان قوماشێکی شڕ و شـیتاڵ کـە تان و پۆی یەکالا بۆتەوە.

**شرائط** / šarā'et/: [عربی] ☜ **شرایط**

**شرائین** / šerā'în/: [عربی] ☜ **شرایین**

**شراب** / šarāb/: [عربی] *اسم.* ـها؛ اشربه *[نامتداول]* شەراو؛ شراو؛ مەی؛ مهە؛ خواردنەوەی ئـەلکولی کە لە گەڕانەوەی ئـاوی میـوە، بەتایبـەت تـرێ بەرهەم دێ.

**شرابخوار** / šarābxār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* شەراوخۆر؛ شەراوخوەر؛ مەیخۆر؛ مەیخوەر؛ خاوەن خوو یان هۆگرەتی بە خواردنەوەی شەراو.

**شرابه** / šarrābe ، ـها/: [عربی]/*اسم.* شۆڕابە؛ شۆڕاوە؛ گێز؛ ڕیشوو؛ گوڵینگە؛ گێزوگوڵیک؛ گێزوگوڵنگە؛ ڕیشۆڵە؛ گیزوگوڵینگی تەوزینی هەڵواسراو بە پەراوێزی شتێک بەتایبەت جلوبەرگەوە: **آویز**

**شرابی** [1] / šarābî/: [عربی]/*اسم.* شەرابی؛ شەراوی؛ ڕەنگی سووری تۆخی ئاماڵ قاوەیی. هەروەها: **شرابی‌رنگ**

**شرابی** [2]: *صفت.* شەراوی؛ شەرابی؛ سووری تۆخی ئامال قاوەیی: ۱. بە ڕەنگی شەراو ۲. پێوەندیدار یان سەر بە شەراو.

**شرارت** / šarārat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* شەڕاشۆیی؛ گەندەژەیی؛ بەدکاری؛ کار یان ڕەوتی هەرا و هوریا، شەڕ یان ئاژاوە نانەوە ‹گاه در خیابان شرارت می‌کرد و مزاحم زن و بچه‌ی مردم می‌شد: جار و بارە لە شەقامدا شەڕناشویی دەکرد و بەری بە ژن و منداڵی خەڵکی دەگرت›.

**شراره** / šarāre ، ـها/: [عربی]/*اسم.[ادبی]* ئاورینگ؛ ئاورنگ؛ هەورینگ؛ کریس؛ کریسک؛ کریسکە؛ پرۆسک؛ پزیسک؛ پزیسکە؛ پزووسک؛ پزووسکە؛ پرشنگ؛ پریز؛ پریزگ؛ پلیز؛ پلیس؛ پریشکە؛ ڤەژەن؛ بزیسک؛ چوریسک؛ قیرسک؛ بریسک؛ برووسکە؛ شەرای ئاگر: **شرر**

**شراع** / 'šerā ، ـها/: [عربی]/*اسم.* بادەبان؛ بادەوان؛ بایەوان؛ بادەوە؛ چارۆکە؛ ئەیاس؛ یەلکەن؛ یەرکەن؛ چارۆکەی کەشتیگەلی پێشوو کە بە هێزی با دەڕۆیشتن.

**شراع‌الحنک** / šerā'olhanak, šarā'olhanak ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ملاشوو؛ مەلاژگ؛ مەلاژی؛ ملاژی؛ ملاشک؛ بن میچی زار کە نەرمە.

**شرافت** / šarāfat, šerāfat/: [عربی]/*اسم.* ۱. شەرافەت؛ دۆخ یان چۆنیەتی شەریف بوون ۲. *[گفتاری]* شەرەف؛ ئابڕوو؛ سەخەر.

**شرافتمند** / -šarāfatmand, šerāfat/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بە شەرەف؛ شەرافەتمەند: **شریف**

**شرافتمندانه** / -šarāfatmandāne, šerāfat/: [عربی/ فارسی] *قید.* شەرافەتمەندانە؛ بە شێوەی سازگار لەگەڵ شەرافەتدا.

**شرافتی** / šarāfatî, šerāfatî/: [عربی] *صفت.* شەرافەتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە شەرافەت.

**شراکت** / šerākat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ۱. هاوبەشی؛ هەڤپشکی؛ شەریکی؛ کار یان ڕەوتی هاوبەش بوون ‹این کار را با شراکت هم انجام دادند: ئەم کارەیان بە هاوبەشی یەکتری بەڕێوە برد› ۲. بەشداری ‹هر دو در آن شراکت داشتند: هەر دوو تێیدا بەشداریان هەبوو›.

**شراکتی** / šerākatî/: [عربی] *قید.* بە هاوبەشی؛ بە شەریکی؛ شەریکانە؛ بە هەڤپشکی ‹خانه را شراکتی خریدیم: خانووەکەمان بە هاوبەشی کڕی›.

**شرایط** / šarāyet/: [عربی]/*اسم.* ۱. جمعِ ☜ **شرط** ۲. بار و دۆخ؛ هەل و مەرج ‹شرایط برای کار مناسب نبود: بار و دوخ بۆ کار لەبار نەبوو› ✽ **شرائط**

**شرایع** / 'šarāye/: [عربی] جمعِ ☜ **شریعت**

**شرایین** / šarayîn/: [عربی] ☜ **شَریان؛ شرائین**

**شرب** / šorb/: [عربی]/*اسم.[ادبی]* کاری خواردنەوە؛ ڤەخوارن؛ ئەوەواردەی؛ نۆشین؛ نۆشان ‹از شرب آب آلوده پرهیز کنید: لە خواردنەوەی ئاوی پیس خۆ بپارێزن›.

**شربت** / šarbat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ۱. شەربەت؛ شەربەتە؛ شەربەتاو؛ خواردنەوەیەک لە ئاو، ئارەق یان شیلە و ماکێکی شیرین (وەک شەکر، قەن، هەنگوین و...) ۲. خۆشاو؛ خوەشاو؛ ئاو میوەی کوڵێنراو (وەک بلالووک، پرتەقاڵ، بەی لیمۆ و...) یان ئارەق (وەک بیمشک، گوڵاو و...) لەگەڵ شەکردا ۳. شەربەت؛ شەربەتە؛ تراوی

خواردنەوە بۆ دەرمان ‹شربت سرفه: شەربەتی کۆخە›.

▣ **شربت بەلیمو:** لیمۆناد؛ شەربەتی بەی کە ئاولیمۆی تێدەکەن و دەیکولێنن.

**شرپا** / šerpā ، ـها؛ ـیان/:/اسم. شرپا؛ هەر یەکە لە کەسانی هۆزگەلی تەبەت، دانیشتووی داوێنی چیاکانی هیمالیا کە لە کەژوانیدا کارامەییان هەیە و ڕێنوێنی و کۆڵەبەری بۆ کەژوانە دەرەکیەکان دەکەن.

**شرجی** / šarcî/: [؟]/اسم. هەڵماوی؛ هەوای شێدار؛ هەوای بۆق‌کردوو؛ کەش و هەوای گەرم و زۆر نمدار.

**شرح** / šarh/: [عربی]/اسم. ١. ڕاژە؛ ڕاڤە؛ شرۆڤە؛ ڕاوە؛ ئازەنتی؛ ئەوەی بۆ هەواڵدانی ڕووداوێک، دۆخێ یان وتەیەک دەگوترێ ‹جریان سفر را شرح داد: ڕەوتی سەفەرەکەی شرۆڤە کرد› ٢. ـها؛ شروح/ شی‌کردنەوە؛ نووسراوە یان وتەیەک کە واتای نووسراوە یان وتەیەکی دیکە دەداتەوە یان ڕاڤەی لە سەر دەکات ‹شرح دیوان نالی: شی کردنەوەی دیوانی نالی›.

▣ **شرح حال:** بەسەرهات: ١. ژیننامە؛ ژیاننامە ٢. دەربڕینی چۆناوچۆنی بار و دۆخێک.

**شرح کَشاف:** [کنایی] ئیبن‌وحەجەر؛ خاس تا خراو؛ گوزارش و بەیانی ڕاڤەکراو هاوڕێ لەگەڵ هەموو وردەکاریەکانیدا: **شرح مبسوط**

**شرح مبسوط** ☜ **شرح کَشاف**

**شرح وظایف:** ئەرکنامە؛ گوزارشتی پێوەندیدار بە ئامانج، پلە و پایەی ڕێکخراوەیی، بەرپرسیاریەتی و ئەرکەکانی پێوەندیدار بە کار و پیشەیەک لە زنجیرە پێگەگەلی دامەزراوەیەکدا.

▣ **شرح دادن:** ڕوونکردنەوە؛ وەدەرخستنی مەبەستی نەزانراو.

**شرح کردن:** ڕاڤەکردن؛ ڕاژەکردن؛ شرۆڤە کردن؛ شی‌کردنەوەی واتا.

**شرح و بسط** / šarh-o-bast ، ـها/: [عربی]/اسم. تاوتوێ؛ شرۆڤەکاری؛ کار و ڕەوتی شرۆڤەکردن بە شێوەی تەواو و بە وردەکاریەوە ‹موضوع را خوب شرح و بسط داده بود: بابەتەکەی چاک تاوتوێ کردبۆوە›.

**شرح و تفسیر** / šarh-o-tafsîr ، ـها/: [عربی]/اسم. ڕاژە؛ ڕاوە؛ ڕاڤە؛ کار و ڕەوتی والاکردن؛ واتا شی‌کردنەوە؛ وەرزین؛ لێکدانەوە.

**شرح و تفصیل** / šarh-o-tafsîl ، ـها/: [عربی]/اسم. ڕاڤەکاری؛ گوزارشێکی تەواو هاوڕێ لەگەڵ وردەکاریەکانیدا.

**شرحه** / šarhe ، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] توێ؛ توا؛ پارچەیەکی تەنک لە هەر شتێ بەتایبەت گۆشت.

▣ **شرحه ــ شرحه:** خارـخار؛ لەت ــ لەت؛ شەقارـشەقار؛ دابەش‌ـدابەش؛ ئەنجن‌ـئەنجن؛ پارچە‌ـپارچە؛ جیا‌ـجیا؛ توێ‌ـتوێ؛ پەل‌ـپەل؛ توا‌ـتوا؛ تۆ‌ـتۆ؛ لەتەـلەتە.

**شرخر** / šarxar ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئەو کەسە ماڵ و سامانی بە گێچەڵ، یان چەک و سفتەی هەڵگەڕاوە، بە نرخێکی هەرزان لە خاوەنیان دەکڕێ، کە لە ڕێگای قانوونیەوە یان بە هەڕەشە بیکاتە پارە و بە قازانج بگا.
هەروەها: **شرخری**

**شرر** / šarar/: [عربی] ☜ **شراره**

**شرزه** / šarze/: صفت. [ادبی] ئازری؛ گرگین؛ توند و تیژ؛ تون و تیژ؛ بە خوو یان ئۆگرەتی کەڵک وەرگرتنی یەکجارە لە هەموو هێز و توان یا نیشاندانی تەواو تووڕەیی خۆ ‹شیر شرزه: شێری ئازری›.

**شرـ شر** / šoršor/: صوت. شۆڕ‌ـشۆڕ؛ چورە‌ـچوڕ؛ خورە؛ چۆڕ‌ـچۆڕێ؛ چوور ــ چار؛ شۆڕە ــ شۆڕ؛ گوڕ‌ـگوڕ؛ خوڕ‌ـخوڕ؛ خم‌ـخم؛ خوش ــ خوش؛ خول ــ خول؛ شڕ ــ شڕ؛ دەنگی دارژانی تراو ‹شرـ شر آب؛ شرـ شر باران: شوڕـ شوڕی ئاو؛

چوره‌ـچوری باران›.

**شرشره** / šoršore/: *اسم. [گفتاری]* ئاوهه‌ڵدێر؛ قه‌ڵبه‌زی بچووکی ده‌سکرد.

**شرط** / šart ، ـها؛ شروط؛ شرایط/: [عربی] *اسم.* مه‌رج؛ گرێو؛ گره‌و؛ گرۆ؛ هۆی: ۱. شه‌رت؛ شه‌رته؛ به‌ندیواری نێوان کار یان دیارده‌یه‌ک له‌گه‌ڵ کار یان دیارده‌یه‌کی تر، به جۆرێ که یه‌کێکیان به‌بێ ئه‌وی دیکه جێبه‌جێ نه‌بێت ‹شرط موفقیت تلاش و پیگیری است: مه‌رجی سه‌رکه‌وتن تێکۆشان و پێداگریه› ۲. کارێ که جێبه‌جێ‌کردن یان به‌جێ هێشتنی له ڕه‌وتی بڕیارنامه‌یه‌کدا وه‌ئه‌ستۆ گیراوه ‹تخلیه‌ی خانه در رأس مدت شرط شده است: چۆڵ کردنی خانووه‌که له سه‌ر ماوه‌ی خۆیدا بۆته مه‌رج› ۳. شه‌رت؛ ئه‌وه‌ی له پێویستیگه‌لی کار یان پله‌وپایه‌یه‌که ‹شرط رفاقت: شه‌رتی دۆستی›.

▣ **به شرط چاقو:** به شه‌رتی چه‌قۆ؛ به مه‌رجی چه‌قۆ لێدان پێش له کڕین ‹بۆ شووتی و جار-جاریش کاله‌ک›.

▣ **شرط بستن:** هۆیاندن؛ مچکاندن؛ گرێوکردن؛ مه‌رج دانان؛ مه‌رج به‌ستن؛ گره‌وکردن/ که‌رده‌ی؛ شه‌رت بینه‌ی.

**شرط کردن:** مه‌رج‌کردن؛ مه‌رج دانان؛ شه‌رت کردن؛ ته‌ی‌کردن؛ شه‌رته‌ره نیه‌ی؛ ڕه‌خسانی بارێک یان کودانی کارێک، جێبه‌جێ‌کردنی ئه‌رکێک له داهاتوودا وه ئه‌ستۆگرتن ‹با فروشنده شرط کردم، اگر لباس اندازه‌ات نبود ببرم عوض کند: له‌گه‌ڵ فرۆشیاره‌که‌دا مه‌رجم دانا که ئه‌گه‌ر جله‌که به‌ به‌رت نه‌بوو ببیه‌م، بیگۆڕێته‌وه›.

**شرط‌بندی** / šartbandî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* گرێو؛ مه‌رج؛ گرۆ؛ مچک؛ شه‌رت؛ جک؛ کاری هۆیاندن؛ مچکاندن؛ بڕیاری دانی شتێ له لای یه‌کێ له دوو لایه‌نه‌وه به‌وی دیکه ئه‌گه‌ر شتێکی دیاریکراو ڕوو بدا یان نه‌دا ‹شرط‌بندی بر سر برنده شدن اسب: گرێو له سه‌ر سه‌رکه‌وتنی ئه‌سپ›.

**شرطی** / šartî/: [عربی] *صفت.* مه‌رجی: ۱. شه‌رتدار ۲. مه‌رجین؛ به مه‌رجی شتێ.

▣ **شرطی شدن:** *[روان‌شناسی]* شه‌رتی بوون؛ مه‌رجی بوون؛ سه‌رهه‌ڵدانی بار و دۆخێک له گیانداردا که له هه‌مبه‌ر دیارده یان کارێکی دیاریکراوه‌وه کاردانه‌وه‌یه‌کی دیاریکراوی هه‌بێ. هه‌روه‌ها: **شرطی کردن**

**شرع** / šar'/: [عربی] *اسم.* شه‌رع؛ شه‌رعه: ۱. دین؛ شه‌ریعه‌ت ‹شرع اسلام: شه‌رعی ئیسلام› ۲. قانوونی دین ‹به حکم شرع: به پێی شه‌رع›.

**شرعاً** / šar'an/: [عربی] *قید.* به پێی دین؛ له شه‌رعدا؛ له سه‌ر بنه‌مای دینی ‹این عمل شرعاً حرام است: ئه‌م کاره به پێی دین حه‌رامه›.

**شرعی** / šar'î/: [عربی] *صفت.* شه‌رعی؛ ئایینی: ۱. دینی؛ پێوه‌ندیدار به دینه‌وه ‹وظایف شرعی: ئه‌رکه شه‌رعیه‌کان› ۲. ته‌با له‌گه‌ڵ ئاییندا ‹عمل شرعی: کاری ئایینی›.

**شرعیات** / šar'îyyāt/: [عربی] *اسم.* شه‌رعیات؛ ئامۆژگاری دینی، به‌تایبه‌ت ئامۆژه‌یه‌ک که پێوه‌ندی به عیباده‌ت و ئه‌رکه دینیه‌کانه‌وه هه‌یه.

**شرف** / šaraf/: [عربی] *اسم.* شه‌ره‌ف؛ سه‌خه‌ر: ۱. ناوچاکی و وه‌جی کۆمه‌ڵایه‌تی که له ڕێز دانان بۆ بایه‌خگه‌لی ئه‌خلاقی به‌دی‌دێ ‹شرف او مانع می‌شد تا پیش دیگران سر خم کند: شه‌ره‌فی نه‌یده‌هێشت سه‌ر بۆ که‌س دانه‌وێنێ› ۲. هه‌ڤیازی مه‌عنه‌وی؛ په‌یڕه‌وی له بایه‌خگه‌لی ئه‌خلاقی به‌رز ‹خانهای قدیم صد بار به این صاحبان مجتمعهای کشت و صنعت شرف داشتند: به‌گه‌کانی پێشوو سه‌د جار شه‌ره‌فیان هه‌بوو به سه‌ر ئه‌م خاوه‌نانی کۆمه‌گه‌لی کشت و پیشه‌یه‌یدا›.

▣ **شرف حضور یافتن:** وه خزمه‌ت گه‌یین؛ خزمه‌ت گه‌وره‌یه‌ک گه‌یشتن.

**شرف صدور یافتن:** فه‌رمان ده‌رچوون.

**به شرف عرض رساندن:** بە گوێ گەورەیەک گەیاندن.

**شرف** / šorof/: [عربی]/سم. ئاسانە؛ هەناز؛ دۆخ یان چۆنیەتی لە ئاسانەدا بوون؛ نزیک بوون.

▣ **در شرفِ:** لە ئاسانەی ‹وقتی او را گرفتند در شرف ازدواج بود: کاتێک گرتیان لە ئاسانەی زەماوەن‌کردندا بوو›.

**شرفه دوزی** / šarafedûzî/: [عربی/ فارسی]/سم. *[خیاطی]* جۆرێک گوڵدوورینی نەخشی گوڵ و بنچکەکەی بە شێوەی ئاڵقەگەلێ لە ناو یەکدا.

**شرفیابی** / šarafyābî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/سم. بە خزمەت گەیشتن؛ چوونە خزمەت؛ چوونە ژوور؛ کاری چوونە خزمەت کەسێکی گەورە یان خاوەن پلە و پایە ‹در روزهای شرفیابی لباس رسمی می‌پوشید و عصازنان خود را به دربار می‌رساند: لە رۆژانی چوونە ژووردا جلوبەرگی رەسمی لە بەر دەکرد و گۆچان بە دەست خۆی دەگەیاندە دەربار›.

هەروەها: **شرفیاب شدن**

**شرق** / šarq/: [عربی]/سم. رۆژهەلات؛ خۆرهەلات؛ خوەرهەلات؛ شەرق: ١. هۆراسان؛ یەکێک لە چوار لای سەرەکی کە بەیانیان هەتاو لەوێوە هەڵدێت ٢. ئەو مەڵبەندانەی وان لە رۆژهەلاتدا: *الف) [مجازی]* ناوی گشتی ولاتانی ئاسیایی و ئافریقایی *ب) [جغرافیا]* ئەو بەشە لە گۆی زەوی کە کەوتۆتە لای رۆژهەلاتی گرینویچەوە.

▣ **شرق اقصا:** رۆژهەلاتی دوور؛ (بریتی لە ژاپۆن و چین و کورە و...).

**شرقاً** / šarqan/: [عربی] قید. لە رۆژهەلاتەوە؛ لە خۆرهەلاتەوە ‹شرقاً محدود است به یک باغ: لە رۆژهەلاتەوە لکاوەتە باخێکەوە›.

**شرق‌شناسی** / šarqšenāsî/: [عربی/ فارسی]/سم. رۆژهەلاتناسی؛ رۆژەلاتناسی؛ خۆرهەلاتناسی. هەروەها: **شرق‌شناس**

**شرقی** / šarqî ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. رۆژهەلاتی؛ خۆرهەلاتی؛ خوەرهەلاتی: ١. پێوەندیدار و سەر بە خەڵکی شەرقەوە ‹موسیقی شرقی: مووسیقای رۆژهەلاتی› ٢. لە لای رۆژهەلاتەوە ‹درِ شرقی؛ کشورهای شرقی: دەرگای رۆژهەلاتی؛ ولاتە رۆژهەلاتیەکان› ❋ **خاوری**

**شرک** / šerk/: [عربی]/سم. شیرک؛ چۆنیەتی باوەڕدار بوون بە زۆرتر لە یەک خودا.

**شرکا** / šorakā/: [عربی] جمعِ ☜ **شریک**

**شرکت** / šerkat/: [عربی]/سم. ١. هاوبەشی؛ کار یان رەوتی هاوبەش بوون ٢. /ـها/ بەشدارگە؛ بەشگە؛ هاوبەشگە؛ کۆبەش؛ شیرکەت؛ دامەزراوەیەکی مافی کە بە هاقۆڵی چەند کەس بۆ چالاکیەکی بازرگانی پێک هاتووە ‹شرکت صنعتی: بەشدارگەی پیشەیی› ٣. ناوکۆیی؛ ناوبەشی؛ هەڤبەشی؛ هاوبەشی؛ هەڤیایی؛ هاودەسی یان هاوڕێیی ‹شرکت در قتل: ناوکۆیی لە کوشتندا› ٤. بەشداری؛ کار یان رەوتی بوون لە رێورەسمێکدا ‹من هم در مجلس قمار شرکت داشتم، ولی بازی نکردم: منیش لە کۆڕی قوماردا بەشداریم بوو، بەلام کایەم نەکرد›.

▣ **شرکت با مسئولیت محدود:** بەشدارگەیێ کە دوو یان چەند کەس بە دەسمایەی دیاریکراوەوە (بێ ئەوەی بەش ـ بەش بکرێت) تێدا هاوبەشن و بە گوێرەی دەسمایەی خۆیان بەرپرسی بەڵێنگەلی بەشدارگەکەیانن: **شرکت نسبی**

**شرکت بیمه:** بەشدارگەی دابین؛ بەشدارگەیەک کە لە بواری پێشکەش‌کردنی خزمەتگەلی دابینکاریەوە چالاکی دەکا. هەروەها: **شرکت پیمانکاری؛ شرکت تولیدی؛ شرکت صنعتی؛ شرکت ساختمانی**

**شرکت بین‌المللی:** بەشدارگەی نێونەتەوەیی.

**شرکت تجاری:** شەریکە؛ هەڤڕایی؛ بەشدارگەی بازرگانی؛ بنکەی هاوبەشی لە بازرگانیدا.

**شرکت تضامنی**: بەشدارگەی هاوئەرکی؛ بەشدارگەیەک کە هەر بەشدارێک بە تەنیایی بەرپرسی هەموو بەڵێنەکانی بەشدارگەیە.
**شرکت تعاونی**: بەشدارگەی هەرەوەزی؛ دابەشگەی زبارەیی؛ بەشدارگەیێ کە بە دەست و سەرمایەی دەستە یان تاقمێ بۆ یارمەتی دانی ئەندامانی خۆی (بە هێنانی شتومەکی پێویست، فرۆشتنی بەرهەم یان بەرێوەبردنی خزمەتەکان) دامەزراوە.
**شرکت چند ملیتی**: بەشدارگەی چەند نەتەوەیی؛ بەشدارگەیێ کە بە هاوقۆڵی خەڵکی چەند وڵات، یان لە لایەن خەڵکی وڵاتێکەوە لە چەند وڵاتی‌تردا دادەمەزرێ.
**شرکت سهامی**: کارجف؛ بەشکۆ؛ بازرگانی هاوبەشی؛ بەشدارگەیێ کە سەرمایەکەی بەش ــ بەش کراوە و دان و ستانیشی پێ دەکرێ.
**شرکت عمومی**: بەشدارگەی گشتی؛ فرەبەش؛ دارایی و داهاتێ کە زۆر کەسی تێدا هاوبەشە.
**شرکت قانونی** ☜ **شرکت قهری**
**شرکت قهری**: بەشدارگەی ناچاری؛ هاوبەش بوونی چەن کەس لە ماڵ و سامانێکدا بەبێ ویستی خۆیان، وەک هاوبەشی میراتبەران لە سامانی کەسێدا کە مردووە: **شرکت قانونی**
**شرکت مضاربه‌ای**: بەشدارگەی پارەبازی؛ بنکەیێ کە لە رێی وەرگرتنی وامی ماوەدار لە خاوەنانی سەرمایە و دانی قازانجێکی لە پێش دیاری‌کراو، سەرمایەی سەرەکی خۆی دابین دەکا.
**شرکت نسبی** ☜ **شرکت با مسئولیت محدود**
⊡ **شرکت داشتن**: ۱. بەشدار بوون؛ هاوبەش بوون؛ لە ڕیزی تاقمێکدا بوون و هێندێک لە تایبەتمەندی یان چۆنیەتی ئەو تاقمە بەخۆگرتن ‹مورچه در رده‌ی حشرات شرکت دارد: مێرووله لە ڕیزی مێرووواندا بەشدارە› ۲. هاودەس بوون؛ هاورێ یان هاوبەش بوون ‹من هم در آن کار شرکت داشتم: منیش لەو کارەدا هاودەس بووم›. هەروەها: **شرکت کردن**
**شرکت‌کننده** / šerkatkonande ، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *صفت*. بەشدار؛ هاوبەش یان هاوکار لە چالاکیەکدا ‹جوانان شرکت‌کننده در مراسم برایش کف زدند و هورا کشیدند: لاوانی بەشدار لە رێورەسمەکەدا چەپڵەیان بۆ لێدا و کردیانە قووله›.
**شرکت‌نامه** / šerkatnāme/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. بەشدارنامە؛ ئەساسنامەی بەشدارگە.
**شرم** / šarm/: /*اسم*. شەرم: ۱. هەستی زیز بوونی عاتیفی بە هۆی: *الف)* گوناح‌کردن و بە هەڵەدا چوون *ب)* هەبوونی عەیب یا کەمایەسی *ج)* پەشیمانی، سەرکۆنە یان سووک بوون ۲. حەیا؛ فەدی؛ فهێت؛ ئەخماز؛ خۆ لادان لە ئەنجامدانی کارێک لە بەر ترس لە زەلیلی و ئابروو چوون ‹او شرم داشت از این‌که دیگران بفهمند ترسیده است: شەرمی بوو لەوەی کە خەڵکی بزانن ترساوە› ۳. حەیا؛ فەدی؛ وێل؛ چاوڕوو؛ چەشوڕی؛ حەیشۆ؛ فەهێد؛ فەهێت؛ دۆخێکی زەینیە کە لە ئەنجامدانی کارێ کە ببێتە هۆی ڕەنجاندن و دڵ شکاندنی کەسێک بەرگری دەکا ‹شرم نگذاشت به او بگویم چقدر از رفتارش آزرده شده‌ام: شەرم نەیهێشت کە پێی بێژم چەندە لە ئاکاری دڵم ئێشاوە›. هەروەها: **شرم داشتن؛ شرم کردن**
⊡ **شرم حضور**: شەرمە؛ دۆخ یا ڕەوتی لە ڕوودامان؛ شەرم‌کردن لە بەرانبەر کەسێکەوە.
**شرم‌آور** / šarmāvar/: *صفت*. ئابڕووبەرە؛ ئاوڕووبەرە ‹رفتار شرم‌آور: ئاکاری ئابرووبەرە›.
**شرمزده** / šarmzade/: *صفت*. شەرمەزار؛ شەرمسار.
**شرمسار** / šarmsār/: *صفت*. شەرمەزار؛ شەرمسار؛ شەرمەندە؛ سەرشۆڕ؛ تریق؛ تەریق؛ دری‌بەردە؛

ڕووزەرد؛ گبر.

**شرمگاه** / šarmgāh/: *اسم.* خەمشە؛ خەپشە؛ خەپلە؛ بانەگا؛ بەرگەدە؛ زارگا؛ زادەگا؛ هێلین؛ شەرم؛ ڕوڤک؛ هەند؛ هەندۆ؛ دلوو؛ بەر؛ بەرموسلدان؛ ئەو بەشەی لەش کە کەوتۆتە سەر ئێسکی ژێر سکەوە.

**شرمگاهی** / šarmgāhî/: *صفت.* بانەگایی؛ هێلینی؛ سەر بە شوێنی بانەگاوە.

**شرمگین** / šarmgîn/: *صفت. [ادبی]* ۱. شەرمەزار؛ خەجالەت؛ ترێق؛ تەریق؛ سەرشۆڕ؛ ڕووزەرد ‹بسیار شرمگین شد: زۆر شەرمەزار بوو› ۲. شەرمێون؛ شەرمۆ؛ شەرمن؛ شەرمین؛ بە شەرم ‹چهرەای شرمگین داشت: سیمایەکی شەرمێونی بوو›.

**شرمندگی** / šarmandegî، ـها/: *اسم.* شەرمەزاری؛ شەرمزاری؛ تەریقی؛ خەجالەتی؛ ڕووزەردی؛ گبریتی؛ فەدیکاری؛ دۆخ یان چۆنیەتی تەریقەوە بوون ‹رفتارش مایەی شرمندگی است: ئاکاری هۆی شەرمەزاریە›.

**شرمنده** / šarmande/: *صفت.* شەرمەزار؛ شەرمزار؛ شەرمسار؛ شەرمەندە؛ شەرمەنە؛ فەدی‌کار؛ سەرشکەستی؛ قۆتۆ؛ تەریق؛ چاوشۆڕ؛ چاڤشۆڕ؛ فهێتکار؛ چاوبەرەژێر؛ فهێدکار؛ خەجالەتبار؛ سەرشۆڕ؛ دەری‌بەردە؛ ڕووزەرد.

**شرنگ** / šarang، ـها/: *اسم. [ادبی]* ۱. ژار؛ ژەهر؛ ماکی ژەهراوی ۲. کالەکەمارانە؛ کەلەکەمارانە؛ گوژەلک؛ گوژالک؛ زەرەند؛ کوزارک؛ زەرەنگ؛ گوندەمنە؛ ژوژالک؛ جۆرە ڕووەکێکی خشۆکی سالانەیە، یارەماکەی لە شووتی دەچێ و بەرەکەی بە قەدەر شەمامەیەک دەبێ، بە کالی، سەوزی خەتخەتە و کە گەییشت وەک شەمامە زەرد دەبێ، زۆر تالە و گەلێک دەرمانی بژیشکی لێ بەرهەم دێ. هەروەها: بەرێک دەگرێت کە وەکوو گوێ وایە، بۆ کوشتنی کرم دەکرێ بە برینی ئاژەلەوە.

**شروح** / šurûh, šorûh/: [عربی] جمعِ ☜ **شرح**

**شرور** / šarûr، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* شەڕهەلایسێن؛ جەنگەران؛ جەنگەری؛ بەدفەڕ؛ دوزەمە؛ ولوەش؛ تووش؛ شەڕانی؛ کێشە هەلایسێن ‹چند تن از افراد شرور را دور خودش جمع کردە بود: چەن کەسی شەڕهەلایسێنی بە دەور خۆدا کۆ کردبۆوە›.

**شر و شور** / šar-o-šûr/: [عربی/ فارسی] *اسم. [گفتاری]* گورخی؛ گورێخی؛ کار و ڕەوتی گەڕان بە شوێن کاری پڕ لە مەترسیەوە.

**شروط** / šurût, šorût/: [عربی] جمعِ ☜ **شرط**

**شروع** / šurû', šorû'/: [عربی] *اسم.* دەسپێک؛ دەسپێکەری؛ سەرەتا ‹ساعت شروع کار: کاتی دەسپێکی کار›. هەروەها: **شروع شدن؛ شروع کردن**

**شر و ور** / šerr-o-ver، ـها/: *اسم. [گفتاری]* هەلیتوپەلیت؛ هیچوپووچ؛ هەلیانوپەلیان؛ هەلەق-مەلەق؛ هاتەران-پاتەران؛ هەلەوشاش؛ بێ‌تەرز و ڕێز؛ وتەگەلی بێ‌سەرە و بەرە.

**شروه** / šarve/: *اسم.* شەروە؛ دووبەیتی ناوچەیی لە زاراوەکانی باشووری ئێراندا کە بەتایبەت لە پرسە و شینگێڕیدا دەیخوێنن.

**شروه‌خوانی** / šarvexānî/: *اسم.* شەروەخوێنی؛ شەروەبێژی؛ کاری خوێندنی ئەو بالۆرە تایبەتە بە ئاهەنگێکی خەمینەوە لە پرسەدا.

**شره** / šare/: [عربی] *صفت. [ادبی]* هەلپە؛ چنۆک؛ چاڤ‌چنۆک؛ چاوچنۆک؛ چاونەزێر؛ چاوبرسی؛ چاڤ‌برسی؛ چلماس؛ چەلماس؛ چەلماسک؛ دەڤبەش؛ پڕکێش؛ تەماکار؛ لێشتۆک؛ هەفهەفی.

**شره** / šorre/: *اسم. [گفتاری]* چوڕە؛ شۆڕە؛ ڕۆیشتنی تراوێک بە شێوەی دلۆپگەلی پەیتا-پەیتا، پتر یە سەر ڕووپەڕێکدا ‹رنگ روی دیوار شره کردە بود: ڕەنگ بەسەر دیوارەکەدا چوڕەی کردبوو›.

**شریان** / šar(a)yān ، ـها؛ شرایین/: [عربی]/اسم. سوورەدەمار؛ خوێنبەر؛ سوورڕەگ؛ دەماری خوێن ڕاگوێز لە لەشدا.

**شریان‌بند** / šar(a)yānband/: [عربی/ فارسی] ☜ **رگ‌بند**

**شریانی** / šar(a)yānî/: [عربی] صفت. سوورەدەماری؛ پێوەندیدار، وێکچوو یان سەر بە سوورەدەمارەوە ‹خون شریانی: خوێنی سوورەدەماری›.

**شریدن** / šorîdan/: مصدر.[گفتاری] چۆڕیان؛ شۆڕان؛ شۆڕیان؛ شۆڕەکردن ‹باران از سر و صروتش پایین می‌شُرید: باران بە سەر و چاویدا دادەچوڕا›.

**شریر** / šarîr ، ـها؛ ـان؛ اشرار/: [عربی] صفت.[ادبی] شەڕانی؛ بەلاگێڕ؛ شەڕهەلایسێن؛ کێشەهەلایسێن؛ جەنگەران؛ بەدفەڕ؛ گونجڕ؛ جینگن؛ تووش؛ شەڕهەلگیرسێن؛ شەڕفرۆش.

**شریعت** / šarî'at ، ـها؛ شرایع/: [عربی]/اسم. ١. دین ٢. ئایین.

**شریف** / šarîf/: [عربی] صفت. ١. بە شەرەف؛ خاوەن شەرەف ٢. هێژا؛ مەزن؛ گەورە؛ بەڕێز؛ ڕێزدار؛ پایەبەرز.

**شریک** / šarîk ، ـها؛ ـان؛ شرکا/: [عربی]/اسم. هاوبەش؛ هاوپشک؛ هەڤبەش؛ هەمبەش؛ هامبەش؛ براوبەش؛ دۆکوت؛ هۆمبیەر: ١. هەمپشک؛ هەڤپار؛ هەڤبەهر؛ هاوپاژ؛ هەڤدار؛ ئەو کەسە بەشێک لە ماڵێکی هەیە ‹او هم در این مغازه شریک است: ئەویش لەم دووکانەدا هاوبەشە› ٢. کەسێ کە لە بەشدارگەیەکدا بەشی هەیە ‹سهم شریک خود را خرید: بەشی هاوپشکەکەی کڕی› ٣. هامیار؛ هەمیار؛ هەمباز؛ کەسێ کە لە کارێکدا لەگەڵ کەسانێکیتر هاوڕێ یان هاودەسە ‹شریک زندگی: هاوبەشی ژیان›.

▣ **شریک جرم**: هاوتاوان؛ کەسێ کە لە ئەنجامدانی تاوانێکدا هاودەسی کەس یان کەسانێکی دیکەیە.

**شریک دزد**: دایکەدزە؛ دەسکیس؛ دزدەسەک؛ دزکە؛ پاش‌دز.

**شریک زندگی**: [کنایی] هاوسەر؛ هامسەر؛ هاوژین؛ هەڤژین؛ هاوجووت؛ هاوجفت؛ هاوبەشی ژیان.

▣ **شریک دزد و رفیق قافله بودن**: [مجازی] سەگی دوولاوەڕ بوون؛ لەگەڵ گورگدا گرتک خواردن و لەگەڵ شواندا شین کردن؛ بە کەروێشک وتن ڕاکە و بە تاژی وتن بیگرە؛ هاریکاری کردنی دوولایەنی پێشبڕکێ.

**شست** / šast/ ☜ انگشت شست، **انگشت**

▣ **شست کسی خبردار شدن**: [مجازی] با بە گوێدا دان؛ گڵ خەبەر بۆ هێنان؛ وریا بوونەوە؛ بە شێوەی لەنەکاو و پتر بە نهێنی لە ڕووداوێک ئاگادار بوون ‹یک وقت شستش خبردار شد کە می‌خواستند او را اِخراج کنند: کاتێ با بە گوێیدا دا کە دەیانویست دەری بکەن›.

**شستشو** / šostešû, šost-o-šû ، ـها/: اسم. گنا؛ بالاڤ؛ شوار؛ شت‌وشۆ؛ کار یان ڕەوتی شۆردن؛ شتن؛ ششتن؛ شواردن؛ شتەی.

▣ **شستشوی مغزی**: [کنایی] کارەڕەهاتی مێشک شۆردنەوە؛ هەڵپێچاندنی کەسێک بۆ دەست هەڵگرتن لە بڕوای فەلسەفی، ڕامیاری یان ئایینی خۆی و پەسەندکردنی باوەڕی نوێ، لە ڕێگای گوشاری زەینییەوە.

**شستن** / šostan/: مصدر.متعدی. // **شستی**: شۆردت؛ **می‌شویی**: دەشۆری؛ **بِشوی**: بشۆرە// شۆردن: ١. شتن؛ شردن؛ شواردن؛ ششتن؛ شۆرین؛ شوشتن؛ شووتن؛ شووردن؛ شویشتن؛ گازرکردن؛ شتەی؛ شۆرتەی؛ لابردنی پیسی لە سەر شتێک بە ئاو (یان تراوێکیتر) و ماکێکی خاوێن‌کەرەوە ٢. شتنەوە؛ شۆردنەوە؛ شورتنەوە؛ ئەوەشتەی؛ ئەوەشۆرتەی؛ لابردنی ماکێک (وەکوو ڕەنگ یان ئەسید) بە دانانی لە نێو

توێنەرێکـدا ٣. سـڕینەوە؛ لابـردنی مـاکێکی نەخوازراو لە سەر شتێک (وەکوو خەڵووز) بە ئاو. هەروەها: **شستنی**

■ صفت فاعلی: **شوینده** (ـ)/ صفت مفعولی: **شسته** (شۆراو)/ مصدر منفی: **نشستن** (نەشۆردن)

**شسته‌ـ رفته** / šosterofte ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* پاک و خاوێن؛ پوخت و جوان؛ پاک و پوختـە؛ جوانکیلە؛ جوانیلکە ‹خانەی شسته ـ رفته‌ای داشت؛ بنشین یک مقالەی شسته ـ رفته بنویس: ماڵێکی پاکوخاوێنی هەبوو؛ دانیشە وتارێکی پوخت و جوان بنووسە›: **شسته و رفته**

**شسته و رفته** / šoste-o-rofte/ ☜ **شسته‌ـ رفته**

**شستی** / šastî ، ـها/: *اسم.* ١. پالێت؛ تەختە ڕەنگی نەققاشی و ڕەسمکێشان ٢. بشکۆک؛ بشکۆژ؛ قوپچە؛ دوگمە؛ دوکمە؛ دوکمەیێ کە قامکی پێوە دەنرێ تا دەزگایێ بکەوێتە کار ‹شستی زنگ اخبار: بشکۆکی زەنگی خەبەر›.

**شش** [1] / šeš/: *اسم.* شەش؛ شش؛ ژمارەی سەرەکی دوای پێنج و بەرای حەوت ‹تا شش بشمار!: تا شەش بژمێرە!›.

**شش** [2]: *صفت.* شەش؛ شش: ١. یەکێک زۆرتر لە پێنج دانە ‹شش مرد؛ شش کتاب: شەش پیاو؛ شەش کتێب› ٢. شەشەم ‹طبقەی شش؛ مرتبەی شش: نهۆمی شەشەم؛ قۆناغی شەش›.

**شش** / šoš ، ـها/: *اسم.* سی؛ سهی؛ سپیەلاک؛ سپەلک؛ سەپەلیک؛ سیپەلاک؛ شیشار؛ شۆشی؛ شمش؛ پیلاسپی؛ شی؛ پشی؛ جەرگی سپی؛ سووێ؛ پشاسپی؛ پوف؛ ئەندامی هەناسەدان لە دەروونداا.

**ششدانگ** [1] / šešdāng/: *صفت.* شەشدانگ؛ ششدانگ؛ هەمووی شتێک ‹ششدانگ حواسش بە حرفهای معلم بود: شەشدانگی هۆشی بە لای مامۆستاوە بوو›.

**ششدانگ** [2]: *قید.* شەشدانگ؛ ششدانگ؛ شەشدانگە؛ ششدانگە؛ بە شێوەی شەشدانگ ‹خانە را ششدانگ بە نام پسرش کرد: ماڵەکەی شەشدانگ کردە ناو کوڕەکەیەوە›.

**ششدر** [1] / šešdar/: *اسم.* شەشخان؛ ششخان؛ شەشدەر؛ ششدەر؛ بارێ لە کایەی نەردێندا کە مۆرەکانی یاریکاری یەکەم لە شەشخانەی پەنای یەکدا جێدەگرن و ئیدی یاریکاری دووهەم هیچ مۆرەیەکی پشتی ئەو شەش خانەی نابزوێ و دەربازی بۆ نیە.

⊡ **بە ششدر افتادن**: شەشدەر لێگیران؛ شەش خان لێبەسران: ١. لە نەردێندا ڕێی دەرباز بوون نەمان ٢. *[کنایی]* کەوتنە تەنگانەوە؛ بێدەرەتان بوون؛ قەتیس داکەوتن؛ بێدەرەتان مانەوە؛ دەرەتان لێبران؛ دەرباز لێبران؛ ڕێ دەرچوون نەمان.

**ششدر** [2]: *صفت. [مجازی]* بێدەرەتان؛ بێدەرباز؛ داماو؛ قەتیس.

⊡ **ششدر کردن**: *[کنایی]* شەشدەر لێگرتن؛ شەشخان لێبەستن: ١. داخستنی شوێنی هەڵاتن لە کەسێک؛ ڕێی ڕاکردنی کەسێک بەستن ٢. هەلی چالاکی لە کەسێک گرتن.

**ششصد** [1] / šeššad/: *اسم.* شەشسەد؛ ششسەد؛ ژمارەی سەرەکی پاش پێنسەد و نەوەد و نۆ و پێش لە شەشسەدویەک.

**ششصد** [2]: *صفت.* شەشسەد؛ ششسەد: ١. یەکێک زۆرتر لە پێنسەد و نەوەد و نۆ ٢. شەشسەدەم.

**ششصدم** / šeššadom/: *صفت.* شەشسەدەم؛ بە ڕیز، پێگە یان جێگەی شەشسەدەوە.

**ششصدمی** / šeššadomî/: ضمیر. شەشسەدەمی؛ ئەوەی لە ڕیز، پێگە یان جێگەی شەشسەدەمدایە.

**ششصدمین** / šeššadomîn/: *صفت.* شەشسەدەمین؛ بە ڕیز، ڕزن، پێگە یان جێگەی شەشسەدەمەوە.

**ششلول** / šešlûl ، ـها/: *اسم.* شەشئاگر؛ شەشار؛ شەشدەرب؛ دەمانچەی تۆپی؛ چەکی گەرمی

کەمەری کە شەش گوللە دەخوات: **ڕۆلور**

**ششلول‌بند** / šešlûlband ، ـها/: *صفت. [کنایی]* زۆربێـژ؛ کەلـەگا؛ خـاوەن خـوو یـان ئـۆگرەتی زۆربێژی و بە چەک هەڕەشە لە خەڵک کردن.

**ششم** / šešom/: *صفت.* شەشەم؛ ششم؛ بـە ڕیـز، ڕزن، پێگە یان جێگەی شەشەوە.

**ششمی** / šešomî ، ـها/: *ضمیر.* شەشـەمی؛ شەشەمین؛ شەشهەمین؛ ئەوەی لـە ڕیـز، پێگـە یان جێگەی شەشەمەوەیە.

**ششمین** / šešomîn/: *صفت.* شەشـەمین؛ شەشهەمین؛ ئەوەی لە ڕیز، پێگە یـان جێگـەی شەشدایە.

**شصت**[1] / šast/: */اسم.* شەست؛ شـەس؛ شێـست؛ هیرڤیستی؛ شەیشتی؛ شەش‌چەل دە؛ ژمـارەی سەرەکی پاش پەنجا و نۆ و پێش لـە شەسـت و یەک.

**شصت**[2]: *صفت.* شەسـت؛ شـەس؛ شێـست: ١. یەکێ زۆرتر لە پەنجا و نۆ ژمـارە ٢. شەسـم؛ شەستەم؛ شێستەم؛ شەسوم.

**شصتم** / šastom/: *صفت.* شێـستەم؛ شەسـتەم؛ شەسم؛ شەسوم؛ بە ڕیز، ڕزن، پێگە یان جێگەی شەستەوە.

**شصتمی** / šastomî/: *ضمیر.* شەسـتەمی؛ شەسەمی؛ شەسومی؛ ئەوەی لە ڕیز، پێگـە یـان جێگەی شەستەمەوەیە.

**شصتمین** / šastomîn/: *صفت.* شەسـتەمین؛ شێستەمین؛ شەستومین؛ بە ڕیز، ڕزن، پێگە یان جێگەی شەستەمەوە.

**شط** / šat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* شەھ ؛ شەت؛ شـاڕۆ؛ ڕووباری گەورە کە لە پێـک‌گەیـشتنی دوو یـان چەند چۆم پێک دێت.

**شطرنج** / šatranc/: [معـرب از پهلـوی]/*اسـم.* شەترەنج؛ شاترنج؛ شـاتورنج؛ شـترنج؛ شـەترنج؛ سـەرترینج؛ یاریـەکی دوو کەسـی بـە سـەر پەڕەیەکی چوارگۆشەوە بە ٦٤ خانۆی یـەک نـا یـەک ڕەش و سـپی و ١٦ مـۆرەی ڕەش و ١٦ مۆرەی سپیەوە بـۆ هـەر یـەک لـە کایەکـەران: **شترنج**

**شطرنج‌باز** / šatrancbāz ، ـها؛ ـان/: [معـرب/ فارسـی]/*اسم.* شەترەنجباز؛ کەسـێ کـە شـەترەنج کایە دەکا.

**شطرنجی** / šatrancî ، ـها/: [معـرب] *صـفت.* شـەترەنجی؛ چوارخانـە؛ خانـەخانـە: ١. بـە نەخشی چوارگۆشەی یەک نایـەک هاوڕەنگـەوە ‹پارچـەی شـطرنجی: قوماشـی چوارخانـە› ٢. بـە هێڵگەلێکی یەکانبڕەوە ‹کاغذ شـطرنجی: کاغـەزی شەترەنجی›.

**شعائر** / ša'āer/: [عربی] ☜ **شعایر**

**شعار** / šo'ār, še'ār ، ـها/: [عربـی]/*اسـم.* دروشـم: ١. ڕسـتە یـان ڕێزوتـەیێ کـە داخـوازی یـان ئامـانجی گرۆیـەک لـە خەڵـکی یـان ڕێکخراوەیـەکی کۆمەڵایـەتی دەخاتـە ڕوو ٢. *[مجازی]* گووپی؛ قسە؛ قسێ؛ وتـەی ئارمـانی یان خۆش کە ناچێتە کار.

▣ **شعار دادن:** دروشم دان: ١. دەربڕینی ئارمانج و داخوازی کۆمەڵێک بـە دەنگـی بـەرز و بـە شێوەی ڕستە یان قسەیەکی دیار ‹دانشجویان شعار می‌دادند، توپ، تانک، مسلسل، دیگر اثر نـدارد: خوێنـدکاران دروشمیـان دەدا، تـۆپ، تانـک، موسلـسەل چیتـر بـاوی نـەماوە› ٢. *[مجـازی]* گـوتنی قـسەی دڵخۆشـکەرانە و زۆر جـار دەکارنەچوو بۆ سەرنج ڕاکێشانی خـەڵـک و تامەزرۆکردنیان ‹تـو کـارت ایـن اسـت کـە شـعار بدهی، اما موقع عمل غیبت می‌زند: تۆ کارت ئەمەیـە کە دروشم بدەی، بەڵام لە کاتی کـردەوەدا نـوقم دەبی›.

**شعاع** / šo'ā' ، ـها؛ اشعه/: [عربی]/*اسم.* ١. تیـشک؛ تریسک؛ تیژک؛ تیریژ؛ تیرۆژ؛ تیژ؛ تریـژ؛ تـیرەژ؛ لیسک؛ بەشت؛ کورزە؛ تیجیە؛ لیزگ ‹شعاع نـور: تیـشکی نـوور› ٢. تیـسک؛ دەسـتە تیـشک

۳. شوعاع؛ نیوتیره؛ لەتە هێڵێکی ڕاست کە ناوەندی جەغز یان گۆ دەلکێنێ بە دەوریەوە ‹شعاع دایره: شوعاعی جەغز› ٤. گزنگ؛ گزینگ؛ تیرێژ؛ هێڵێکی گریمانەیی کە نوور لەوێوە تیشک ئەداتەوە ‹شعاع خورشید: گزنگی هەتاو›.

**شعاعی** / šo'ā'î/: [عربی] *صفت.* تیشکی؛ شوعاعی؛ پاڵدراو یان سەر بە شوعاعەوە.

**شعایر** / ša'āyer/: [عربی]/*اسم.* ۱. ئامانجگەل؛ ئارمانێ؛ دۆزگەل ‹شعایر ملی: دروشمگەلی نەتەوەیی› ۲. دروشمگەل؛ نیشانەکانی ئایین یان ئامانجێک ‹شعایر دینی: دروشمگەلی دینی›.

**شعب** / šo'ab/: [عربی] جمعِ ☜ **شعبه**

**شعبات** / šo'abāt/: [عربی] جمعِ ☜ **شعبه**

**شعبان** / ša'bān/: [عربی]/*اسم.* شابان؛ شەعبان؛ کوڵەمانگ؛ هەشتەمین مانگی ساڵی کۆچی‌مانگی، پێش ڕەمەزان.

**شعبده** / šo'bade، ـها/: [عربی]/*اسم.* ۱. تەڕدەستی؛ چاوبەستی؛ کارێ کە بە بزێوی و فریودانی هەستی بینەر ئەنجام دەدرێ و دەبێتە هۆی خەڵەتاندن و سەرسوورمانی ۲. فێڵ؛ فریو؛ گزی؛ گەڕ؛ گڕنی؛ حەوقە؛ نێرەنگ.

**شعبده‌باز** [1] / šo'badebāz، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* تەڕدەست؛ چاوبەست؛ چاچۆڵباز؛ کەسێ کە کار و باری چاوبەستیە.

**شعبده‌باز** [2]: *صفت. [مجازی]* چاوبەست؛ فێڵباز؛ فریوکار؛ گزیکار؛ گڕنیکەر؛ حەوقەباز؛ گغنی‌باز.

**شعبده‌بازی** / šo'badebāzî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* چاوبەستی: ۱. تەڕدەستی؛ چاچۆڵبازی؛ کاری چاچۆڵباز ۲. نواندنی تەڕدەستی ۳. *[مجازی]* فێڵبازی؛ گزیکاری؛ گڕنی‌بازی؛ گغنی‌بازی؛ فریوکاری؛ حەوقەبازی؛ خاپینۆکی.

**شعبه** / šo'be، ـها؛ شُعَب؛ شُعَبات/: [عربی]/*اسم.* لق؛ لەق؛ لک؛ بەشێ لە دامەزراوەیەک کە کار و باری دیاریکراوی وەئەستۆیە یان لە ناوچەیەکی دیاریکراودا چالاکی هەیە ‹شعبەی بانک: لقی بانک›.

**شعر** / še'r، ـها؛ اشعار/: [عربی]/*اسم.* شیعر؛ هۆزان: ۱. هۆنە؛ هەڵبەست؛ هۆنراوە؛ هلبەست؛ نەوشە؛ وتەیێ کە کێش، بەشاوەند (قافیە) و واتای هەیە ۲. هلبەست؛ وتەی کێشدار ۳. بەرهەمی ئەزموون، بینین، هەست و داهێنانی هونەری شاعیر ٤. *[تعریض]* قسە؛ وتەیەکی جوان کە لە کار نایێ ‹سادگی، قناعت، زندگی در دامن طبیعت، اینها که می‌گویی شعر است: ساکاری، چاوتێری، ژیان لە داوێنی سروشتدا، ئەمانە کە دەڵێی هەموو شیعرن›.

▣ **شعر آزاد:** شیعری ئازاد؛ شیعری باز؛ شیعری نوێ؛ هەڵبەستێ کە پەیڕەوی ئاهەنگ و کێش و بەشاوەند نیە: **شعر نو**

**شعر بزمی** ☜ **شعر غنایی**

**شعر بند تنبانی:** *[کنایی]* میعر؛ وتەی کێشدارێ کە بایەخی هونەری نیە.

**شعر بی‌معنی:** شیعری بێ‌واتا؛ شیعری بێ‌ناوەرۆک؛ هەڵبەستێ کە هەست و هزری تێدا نیە و تەنیا بە پێی بنەماگەلی شیعری هۆنراوەتەوە.

**شعر تعلیمی:** شیعری پەروەردەیی؛ شیعری ئامۆژگاریانە؛ هەڵبەستێ کە لایەنی پەروەردەیی و خووخدەیی تێدا هەیە.

**شعر تغزلی** ☜ **شعر غنایی**

**شعر حماسی:** شیعری پاڵەوانی؛ شیعری ئازایەتی؛ هەڵبەستێ کە باسی پاڵەوانی و بوێری هێندێ کەس دەکا.

**شعر سپید/ سفید:** شیعری سپی؛ جۆرێک هەڵبەستی ئازاد (لە وێژەی ئورووپادا) کە زۆرتر پێنج برگەیی و بێ‌بەشاوەندە.

**شعر عروضی:** شیعری عەرووزی؛ هەڵبەستێ کە سەرتاسەری کێشێکی دیاریکراوی (بە

ناوی بەحر) هەیە.
**شعر غنایی:** هەڵبەستی دڵداری؛ شیعری ئەویناری؛ هەڵبەستێ کە هەستی دڵداری و تەزووی عاتیفی تێدا دەگوترێ: **شعر بزمی؛ شعر تغزّلی**
**شعر نو** ☜ **شعر آزاد**
**شعر هجایی:** شیعری بڕگەیی؛ هەڵبەستێ کە پایەی کێش تێیدا، ژمارەی بڕگەی باڵەکانە، وەک شیعری فولکلوری کوردی کە بیست بڕگەی چواربەشییە.
▣ **شعر سرودن:** شیعر دانان؛ شیعرگوتن؛ شیعر هەڵبەستن؛ شیعر هۆنینەوە.
**شعرا** / šeʻrā /: [عربی]/اسم. *[نجوم]* دوو ئەستێرە لە کەلووی سەگی گەورە و سەگی بچووکدا.
▣ **شعرای شامی:** هەشتەمین ئەستێرەی ڕووناکی ئاسمان لە وێنەی گەردوونی سەگی بچووکدا.
**شعرای یمانی:** گەلاوێژ؛ کاروان‌کوژە؛ پرشنگدارترین ئەستێرەی ئاسمان لە وێنەی گەردوونی سەگی گەورەدا.
**شعرا** / šoʻarā /: [عربی] جمعِ ☜ **شاعِر**
**شعرباف** / šaʻrbāf ، ـها؛ ـان /: [عربی/ فارسی]/اسم. *[قدیمی]* شاڵباف؛ کەسێ کە کاری چنینی پارچەی دەسچنە.
**شعربرنیکه** / šaʻrebrenîke /: [؟] ☜ **گیسو ـ۲**
**شعری** / šeʻrî /: [عربی] *صفت*. شیعری؛ پێوەندیدار یان پاڵدراو بە شیعرەوە ‹تخلص شعری: نازناوی شیعری›.
**شعف** / šaʻaf /: [عربی]/اسم. *[ادبی]* خۆشی؛ وەشی؛ شادی؛ شایی؛ شادمانی؛ خۆشحالی ‹موجب شعف زایدالوصفی شد: بووە هۆی خۆشیەکی لەڕادەبەدەر›.
**شعله** / šoʻle ، ـها /: [عربی]/اسم. بلێسە؛ بلیسە؛ شۆڵە؛ گڕپە؛ گڕ؛ گڕە؛ کڵپە؛ کڵ؛ میرگە؛ کور؛ گڕو؛ گرشە؛ گوڕی؛ ئالاڤ؛ پێت؛ سۆڵە؛ ڕڤین؛ شەماڵە ۱. بەشێ لە ئاگر کە وەک گازێکی دەرەوشاوەی لێ‌هاتووە ‹شعلەی گاز: بلیسەی گاز› ۲. بەشی ڕووناک و دەرەوشاوەی ئاگر کە هەڵدەچێ ‹شعلەی آتش؛ شعلەی شمع: گڕی ئاگر؛ گڕی شەم› ۳. *[مجازی]* هەر شتێ کە وەک ئاگر بدرەوشێتەوە ‹شعلەی امید؛ شعلەی عشق: گڕی هیوا؛ بلیسەی ئەوین› ٤. یەکەی هەژماردن بۆ ئامێرگەلی ڕووناکیدەر (وەکوو شەم یان چرا) ‹توی این مغازه هشت شعله چراغ روشن است: لەم دووکانەدا هەشت شۆڵە چرا هەڵبووە›.
**شعله‌پخش‌کن** / šoʻlepaxškon ، ـها /: [عربی/ فارسی]/اسم. شۆڵەپەڕشێن؛ ئامرازێکە وەک ڕووپەڕێکی کون-کون بۆ بەرگری لە لێکەوتن یان لێدانی ڕاستەوخۆی شۆڵە و بلاوکردنەوەی تینەکەی.
**شعله‌ور** / šoʻlevar /: [عربی/ فارسی] *صفت*. گەش؛ دایسیاو: ۱. ڕۆشن؛ پەشقەل؛ گڕدار؛ مەشقەڵان؛ شۆڵەدار؛ بای دایسان ‹هنوز آتش شعله‌ور است: هێشتا ئاگرەکە گەشە› ۲. *[مجازی]* نێڵدار؛ بە تین یان تەیسەوە ‹آتشی در دلم شعله‌ور شد: ئاورێکم لە دەروون دایسا›.
▣ **شعله‌ور شدن:** داگرسان؛ داگیرسان؛ داگرسیان؛ هەڵگرسان؛ دایسان؛ هەلاییسان؛ ئاییسان؛ ئەنەگیسیەی؛ بلێسە دان؛ پێ‌بوون؛ هەڵبوون؛ گوڕگردن.
**شعله‌ور کردن:** داگرساندن؛ داگیرساندن؛ داگریساندن؛ هەڵگرسانن؛ دایساندن؛ هەلاییساندن؛ ئاییساندن؛ ئەنەگیسنەی؛ پێ کردن؛ هەڵکردن.
**شعور** / šuʻûr, šoʻûr /: [عربی]/اسم. ئاوەز؛ ئاوز: ۱. ژیرڤانی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ئاگاداری لە شتێک، بەتایبەت لە بار و دۆخی زەینی خۆ ۲. ژیرڤانی؛ چۆنیەتی ئاگاداری لە شتێ، دۆخێ یان هەڵکەوتێکی دەرەکی ۳. ژیرڤانی؛ دۆخێ کە هەست، خواست، عاتیفە و بیرکردنەوە لە تایبەتمەندیەکانیە ٤. ژیرڤانی؛ فەرهەنگ؛ ئەقڵ؛

هۆش؛ شعوور؛ سەرجەمی دۆخگەلی ئاگایانەی کەسێک ٥. وشیاری؛ لە سەرهەستی؛ ئاگەهی؛ هینایی؛ دۆخی ئاسایی ژیانی ئاگادارانە کە مرۆ لە حاڵی خەو، بێهۆشی، مەستی یان نەخۆشیدا نیەتی.

**شغار** / šaqār/: [آرامی] ☜ **شخار**

**شغار** / šeqār/: *اسم. [قدیمی]* ژنبەژن؛ ژنوەژن؛ ژناوژن؛ ژنبەژنە؛ بەردیل؛ ژەنبەژەنی؛ پێک‌گۆڕینەوەی دوو کچ (یا ژن) لە کۆندا، کە مارەیی هەر کامیان لە گرۆی ئەوی دیکەدا بوو.

**شغال** / šoqāl، ـها؛ ـان/: *اسم.* چەقەڵ؛ تۆڕی؛ توری؛ تۆڕک؛ توورک؛ تورگ؛ گەرەشاخ؛ کەمچانە؛ برقەندەرە؛ تۆڕ؛ توێڕی؛ تویری؛ توویری؛ تێروو؛ تووری؛ تۆری؛ واویک؛ گیانداریکی گوانداری دڕندە و شەوڕۆیە وەکوو گورگ بەڵام نەختێ بچووکترە و لە گۆشتی ڕاو، تۆپیو و برێ جار میوەیش دەخوا و زۆرتریش بە کۆمەڵ ڕاو دەکا.

**شغالدست** / šoqāldast، ـها/: *اسم.* سەگدەست؛ تەوەرەیەک کە چەرخی پێشی ماشین ڕادەگرێ بەڵام خۆی لەگەڵ چەرخەکەدا ناسووڕێتەوە.

**شغل** / šoql، ـها؛ مشاغل/: [عربی] *اسم.* کار؛ ئیش؛ پیشە؛ شوغڵ؛ کاربەند؛ شوول؛ فەرمان: ١. چالاکی بەردەوام و پتر ڕێک‌وپێک‌کراوی کەس، تاقم یان جەماوەر، بەتایبەت لەو بوارانەدا کە قازانجی ئابووری هەیە ‹شغل آزاد؛ شغل تولیدی: کاری ئازاد؛ کاری بەرهەمهێنەر› ٢. هەرمانە؛ هەرمان؛ گوروە؛ گورە ‹وقتی از شغل او پرسیدم، گفت دانشجوست: کاتێ کە لە کاریم پرسی، گوتی خوێندکارم›.

▣ **شغل آزاد**: کاری ئازاد: ١. پیشەی نادەوڵەتی ٢. شوغڵێ کە خاوەنەکەی کارفەرمای نیە.

**شغلی** / šoqlî/: [عربی] *صفت.* پیشەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کارەوە ‹امنیت شغلی؛ پیشرفت شغلی: هێمنی پیشەیی؛ پێشکەوتنی پیشەیی›.

**شفا** / šafā, šefā/: [عربی] *اسم.* شفا؛ مفا؛ مەفا؛ موفا؛ چۆنیەتی چا بوونەوە لە نەخۆشی، بەتایبەت بە هۆی خودا، پێغەمبەر و شتانی پیرۆزەوە.

▣ **شفا بخشیدن**: چاکردنەوە؛ خاسەوکردن؛ خوەشەوکردن؛ وەشەوەکەردەی؛ شفا دان: **شفا دادن**

**شفا خواستن**: داوای چا بوونەوە و ڕزگار بوون لە نەخۆشی بۆ کەسێ کردن.

**شفا دادن** ☜ **شفا بخشیدن**

**شفا گرفتن**: چا بوونەوە؛ خاس بوونەوە؛ خوەشەو بوون لە نەخۆشی بە هۆی دەسەوداوێنی پیرۆزەکانەوە.

**شفا یافتن**: چاک بوونەوە؛ چا بوونەوە؛ ساقەو بوون؛ خۆش بوون؛ خۆشەو بوون؛ خوەشەوە بوون؛ خاس بوونەوە؛ وەشەوە بیەی؛ قەترسین؛ قەتەڕستین؛ لە نەخۆشی هەستانەوە ‹دو روز بعد چشمش شفا یافت: پاش دوو ڕۆژ چاوی چاک بوودەوە›.

**شفابخش** / šafābaxš, šefā-/: [عربی/فارسی] *صفت.* چاکەرەوە؛ خۆش‌کەرەوە؛ وەشەوەکەر؛ شەفابەخش؛ شەفادەر؛ هۆی خاس بوونەوە یان دەرمان ‹داروی شفابخش: دەرمانی چاکەرەوە›.

**شفاعت** / šafā'at, šefā'at، ـها/: [عربی] *اسم.* ناڤبێژی؛ ناڤچێتی؛ مەهدەر؛ مەدەر؛ دیلەک؛ شفات؛ خوایشت؛ هێڤی؛ تکا؛ کار یان ڕەوتی پاڕانەوە لە کەسێک بۆ چاوپۆشی‌کردن لە گوناهی کەسێکی‌تر. هەروەها: **شفاعت کردن**

**شفاف** / šeffāf/: [عربی] *صفت.* ڕوون؛ ڕۆشن؛ زەلاڵ: ١. ڕووتەنک؛ زولاڵ؛ پاش‌بین؛ ڕووهن؛ بێ‌لێڵایی؛ بە تایبەتمەندی لە خۆ ڕەدکردنی ڕووناکی و دیاربوونی دیمەنی پشتەوەی ٢. *[مجازی]* بەبێ لێڵی و شاراوەیی ‹سیاست شفاف: سیاسەتی ڕوون›.

**شفافیت** / šeffāfîyyat ، ـھا/: [عربی]/اسم. ڕوونی؛ ڕووتەنکی؛ زەلالی؛ ڕۆشنی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕوون بوون.

**شفاهاً** / šafāhan, šefāhan/: [عربی] قید. زمانی؛ زوانی؛ دەمی؛ زارەکی؛ بە دەمی؛ بە وتن؛ بە قسە کردن؛ بە ئاخاوتن نەک نووسین ‹شفاهاً دستور داده شده بود: زمانی فەرمان درابوو›.

**شفاهی** / šafāhî, šefāhî/: [عربی] صفت. زارەکی؛ دەمی؛ زمانی؛ زوانی؛ بە تایبەتمەندی ئەوەی کە بە زمان دەردەبڕدرێ ‹امتحان شفاهی؛ دستور شفاهی: ئەزموونی زارەکی؛ فەرمانی دەمی›.

**شفت**[1] / šaft/: [انگلیسی] ☜ **شافت**

**شفت**[2]: صفت. [فارسی] /گیاه‌شناسی/ گۆشتن و شکۆفا؛ بە ناوکێکی ڕەقەوە کە دەنک یان دەنکەکانی دەگرێتە بەر (لە مەڕ میوەی وەک هەڵووژە، قۆخ، گیلاس و...).

**شفتالو** / šaftālû ، ـھا/: اسم. هەشتالوو؛ هەشتالوێ؛ شەفتالوو؛ شەفتالی؛ قۆخ؛ قۆخی؛ خۆخ: ۱. دارێک بە توێکڵی قاوەیی ڕۆشن، گەڵای درێژۆکە یان نوسکن، گوڵی تاک کە بەر لە وەچ دەردێ ۲. بەری خۆراکی ئەم دارە کە خڕ، تووکن، کەسک یان ئاڵ و بەشێکی سوورە و پێشەی هێلکەیی کە بە گۆشتەکەیەوە نووساوە.

**شفته** / šefte ، ـھا/: اسم. شفتە؛ تێکەڵاوی ماسە و قسلی شل و ئاودار کە بۆ بنەڕەت و ژێرسازی خانوو بە کار دەڕوا.

**شفشاهنگ** / šafšāhang ، ـھا/: ☜ **استالاگمیت**

**شفعه** / šof'e/: [عربی] ☜ حق شفعه، **حق**

**شفق** / šafaq/: [عربی]/اسم. زەردەپەڕ؛ خۆرەزەرد؛ خۆرەزەردکە؛ وەرەزەردە؛ وەرەشێلە؛ ئاسۆی سوور دەکاتی ئێوارەدا.

**شفقت** / šafaqat, šafaq(q)at/: [عربی]/اسم. دڵنەوایی؛ دلۆڤانی؛ دڵنەرمی؛ هاودەردی؛ هامدەردی؛ نەرم و نیانی هاوڕێ لەگەڵ بەزەییدا ‹زلزلەزدگان را مورد شفقت قرار دادند: لە بوومەلەرزەلێدراوان دڵنەواییان کرد›.

**شفیرگی** / šafîregî/: اسم. مێتوولکەیی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی مێتوولکە بوون.

**شفیره** / šafîre ، ـھا/: اسم. قۆزاحە؛ مێتوولکە: ۱. بێچووی ساوای مێروو کە وەک مێرووی پێگەیشتووە و تەنیا باڵی کەمە و دەزگاری زاوزێی تەواو نیە ۲. قۆناخێ لە خولی ژیانی برێ مێروو، لە نێوان ساوایی و پێگەیشتندا کە چالاکی ژیانی تێیدا دەگاتە کەمترین ئاستی خۆی.

**شفیع** / šafî' ، ـان/: [عربی]/اسم. تکاکەر؛ تکاکار؛ بەرەوان؛ ناوەنی؛ دیلەکچی؛ ناقبێژ؛ شفاتکەر ‹شفیع روز قیامت: تکاکاری ڕۆژی پەسلان›.

**شفیق** / šafîq ، ـان/: [عربی] صفت. /ادبی/ دڵنەوا؛ دلۆڤان؛ دڵنەرم؛ بەبەزەیی؛ دڵسۆز و میهرەبان ‹رفیق شفیق: هەواڵی دڵنەوا›.

**شق** / šaq(q)/: صفت. ڕەپ؛ بە شێوە یان بارێ کە لە خوڕا چەم و ڕاست نابێتەوە و لۆچ و دەقیش هەڵناگرێ ‹آمد و با گردن شق جلو میز ایستاد: هات و بە ملێکی ڕەپەوە لە بەر مێزەکە ڕاوەستا›.

**شق** / šeq(q) ، ـھا؛ شقوق/: [عربی]/اسم. بژاردە؛ یەکێک لە دوو یان چەند شێوازی کار یان باری ڕەخساو ‹غیر از این دو، شق دیگری وجود ندارد: بێجگە لەم دوانە، بژاردەیەکی‌تر نیە›.

**شقاق** / šeqāq/: [عربی]/اسم. ۱. دووبەرەکی؛ ناتەبایی؛ ناکۆکی؛ دژایەتی؛ جیایی؛ دوودەسەیی ۲. /پزشکی/ قەڵش؛ قلیش؛ تلیش؛ شەقار؛ شەق و لێکبەربوویی یان قەڵشاوی لە موخاتدا.

**شقاقل** / šaqāqol ، ـھا/: اسم. چەپۆڵە؛ گێزەرۆکە؛ گێزەرەدەشتی؛ گێزەری دەیمی؛ گێزەری زیر؛ گێزەری سپی؛ گیایەکی شڤشینک یان دوو ساڵان، بە بنجاری سپی و ئەستوور و گەڵای بۆنخۆشەوە.

**شقاقلوس** / šaqāqolûs/: [معرب از یونانی]/اسم.

[قـدیمی] شـەقاقلووس؛ مـەرگی بەشـێک لـە شانەگەلی لەش بە هۆی پێ نەگەیشتنی خوێن، لێدران یان گەناژۆیی.

**شق‌القمر** / -šaqolqamar, šaqqo/: [عربی]/اسم. [مجازی] کێـو کەنـدن؛ کێـو لـە بنـەوە هێنـان؛ کۆکەنتەی؛ کاری زۆر گران و جێبەجێ‌نەکراو.

**شقاوت** / šeqāvat, šaqāvat، ـها/: [عربی]/اسم. دڵڕەقی؛ بێ‌ڕوحمی ‹شقاوت او حتی مورد اعتراض همراهانش قرار گرفت: دڵڕەقی ئەو تەنانەت بووە هۆی ناڕەزایەتی هاوڕێیانی›.

**شقاوت‌آمیز** / -šeqāvatāmîz, šaqāvat/: [عربی/ فارسی] صفت. دڵڕەقانە؛ بێ‌بەزەییانە؛ بێ‌ڕوحمانە؛ بێ‌ڕەحمانە؛ تێکـەڵ و لەگـەڵ دڵـڕەقیدا ‹رفتار شقاوت‌آمیز: ئاکاری دڵڕەقانە›.

**شـقایق** / šaqāyeq، ـها/: [عربی]/اسم. گوڵاڵـە؛ گوراڵـە؛ هەڵاڵـە؛ گوڵاڵەسـوورە؛ سوورەهەڕاڵـە؛ گوڵەخەندران؛ گوڵـەبەوی؛ گوڵەمۆڵـە؛ نیـسان؛ کورکەنیـسان؛ مـێلاق؛ مێلاقـە؛ خەشخاشـک؛ گوڵاڵە سوورەی بەهاران؛ گیایەکی ئالیکی جوان لـە تـیرەی هەڵاڵـە، بـە گـەڵای تـووکن و بڕگە-بڕگە، گوڵی سووری تۆخ و پەڵەـ پەڵـەی ڕەش، پەرچەمی زۆر و بـەری وەک خەشـخاش بەڵام بچووکتر.

▣ **شـقایق نُعمـانی**: گوڵـەمزیـانی؛ گوڵـەمـزانی؛ گوڵەهەڕاڵە؛ گونگلۆک؛ گونگیلۆک؛ گیایـەکی ئالیکی جوان لە تـیرەی هەڵاڵـە، بـە گـەڵای بڕگە- بڕگە، گوڵی تـاکی بنـەوش یـان ئامـاڵ سوور، بێ‌بۆن و بە تامی تفت و توونەوە.

**شـقایق‌دریـایی** / šaqāyeqedaryāyî، شـقایقهای دریایی/: [عربی/ فارسی] /اسم. هەڵاڵـەی دەریـایی؛ جۆرە گیانداریکی ڕەنگینی دەریایی جوانـە، لـە گوڵاڵە دەچێ و بە بەردەوە دەنووسێ.

**شـقـــ شـق** / šeq-šeq/: صوت. تەقەتـــەق؛ قرچـەقرچ؛ چەقەچـەق؛ دەنگـی نزمـی کـەم زایەڵەی وێـک‌کـەوتنی شـتگەلی وردکـە (وەک ددان یان پووڵە وردە).

**شقراق** / šeqerrāq، ـها/: اسم. [؟] [جانورشناسی] سەوزەمراوی؛ مراویەکێوی؛ پـێ‌بەقنگـە؛ جـۆرێ مراوی سـەر و مـل سـەوز و سـنگ خەنـەیی و پشت قاوەیی بە دەنووکی زەردی مەیلەو سـەوز و قاچی مەیلەو خەنەیی.

**شـــق‌ورق** / šaqq-o-raq(q)/: صـفت. [گفتـاری] ڕەپ؛ بێ‌چین و لۆچ ‹اتوی شلوارش خیلی شق و رق بود: دەقی پانتۆڵەکەی زۆر ڕەپ بوو›.

**شق‌ورق**: قید. [مجازی] ڕەپـــ ڕەپ؛ ڕەپ‌وڕەق؛ تەق‌وڕەق؛ شەق‌وتەق ‹شق‌ورق ایستاده بـود و مژە هـم نمـی‌زد: ڕەپـــ ڕەپ ڕاوەسـتابوو و چاویـشی نەدەترووکاند›.

**شقوق** / šoqûq, šuquq/: [عربی] جمعِ ☜ **شِق**

**شـقه** / šaqqe، ـها/: [عربـی]/اسم. کـوت؛ لـەت: ۱. کەرت؛ کەر؛ لا؛ پارچە؛ پاژ؛ پاژێ لـە شـتێک (وەکوو لاشەی پەز) ۲. قاش؛ کـاش؛ کـووز؛ قـاژ؛ ئەوەی بە لێدان بووە بە چەند کەرتەوە ‹گوشت را شقه کرد، و گذاشت توی یخچـال: گۆشـتەکەی کـوت کرد و نایە نێـو یەخچاڵـەکەوە›. هـەروەها: **شـقه شدن؛ شقه کردن**

**شـقی** / šaqî، ـها؛ اشقیا/: [عربی] صفت. [ادبی] دڵڕەق؛ بـێ‌بـەزەیی ‹ظـالم شـقی؛ آدم شـقی: چەوسێنەری دڵڕەق؛ مرۆی بێ‌بەزەیی›.

**شـقیقه** / šaqîqe، ـها/: [عربـی]/اسم. لاجانـگ؛ بلاجانـگ؛ بناجانـگ؛ لاجـان؛ لاتیـاگ؛ تـیلاگ؛ جانگیە؛ جینگ؛ گێجەنە؛ گێجگـا؛ بەشـێک لـە لای ژوورینی چار لە نێـوان سـیلەی چـاو هـەتا گوێ.

**شک** / šak(k)، ـها/: [عربـی]/اسم. شـک؛ شـکە؛ دشـک؛ گومـان؛ گـەمان؛ دڕدۆنگـی؛ دوودڵـی؛ هەدان؛ هێدان؛ شەی؛ ڕوێز: ۱. / شکیّات؛ شکوک/ چۆنیەتی نرخاندن یان داوەری بـە دڕدۆنگیـەوە ‹شک دارم این کار درست باشد: شکم هەیە ئـەم کـارە دروست بێ› ۲. بەدگومانی؛ نوون ‹مثل این‌کـه تـو

بە من شک داری: وا دیارە لێم دردونکی›.

▣ **شک بردن کسی:** شک بـردن؛ شـک کـردن؛ دوودڵ بوون؛ دڕدۆنگ بـوون؛ گومـان بـردنی کەسێک؛ بە دڵاهاتنی کەسێک ‹حتی شک‌شان نبـرد کـە ممکـن اسـت مـن گفتـه باشـم: تەنانـەت شکیشیان نەبرد، گاهەز من گوتبێتم›.

**شک داشـتن:** ١. دوودڵ بـوون؛ شـک‌کـردن؛ دڕدۆنـگ بـوون ٢. بـەدگومان بـوون؛ دوودڵ کەفتن؛ دڵ‌کرمێ بوون. هەروەها: **شک کردن**

**شک رفتن به کسی:** شک چوون بـۆ کەسـێک؛ لە کەسێک دوودڵ بوون؛ شـک چوونـە سـەر کەسێک؛ شکە پەی یۆی لوەی؛ لـە کەسـێک بەدگومان بوون ‹شک من به همسایه‌ی روبرویـی رفت: شکم چوو بۆ هاوسا بەرامبەرەکە›.

**شـک کـسی را برداشـتن:** کەوتنـە شـکەوەی کەسێک؛ دوودڵ کـەوتنی کەسـێک؛ کەسـێ کەوتنە گومانەوە: ١. دڕدۆنـگ بـوون؛ دوودڵ بـوون ‹شـک بـرم‌داشـت، نکنـد پـول کـم بیایـد: کەوتمـەشـکەوە، نـەکا پـارە بـەش نـەکا› ٢. بەدگومان بوون؛ گومانی خراو بردن ‹شک برش‌داشت که شاید او دزد بوده: کەوتە شکەوە ناکـا ئەو دز بووبێت›.

**بـه شـک افتـادن:** کەوتنـە شـکەوە؛ بـە شک‌کەوتن؛ کەوتنە نێو دوودڵـیەوە؛ تووشـی شک و دوودڵی و گومان بوون.

**شک** / šok/: [فرانسوی] ☜ **شوک**

**شکات** / šokāt/: [عربی] جمعِ ☜ **شاکی**

**شـکار**[1] / šekār/: اسـم. ڕاو؛ ڕاف؛ ڕاوە؛ شـکار؛ ئـشکار؛ کـەروە: ١. شـژ؛ کـار و ڕەوتی وەگـیر خستنی گیانەوەری کێوی یان هەڵاتوو ٢. شـژ؛ کار یان ڕەوتی گرتن، کوشـتن یـان هەڵـدڕینی گیانەوەرێک بۆ خـواردن ‹گربـه همـه‌ی موشـها را شکار کرد: پشیله گشت مشکەکانی ڕاوکرد› ٣. ـها/ نێچیر؛ نچیر؛ ئەو گیانەوەرەی کـە بـە کوشـتن، زامار کردن یان تەڵە گیراوە ‹برایمان گوشت شکار آورده بود: گۆشتی ڕاوی بۆ هێنابووین› ٤. شژ؛ کـرد و کۆشێ کە بە مەبەستی کوشتن، بریندار کردن یان دە تەڵـە و داو خـستنی گیانـەوەر دەکـرێ ‹رفته بودم شکار، ولی دست‌خالی برگـشتم: ڕۆیـشتبووم بۆ ڕاو، بەڵام، دەم‌لەپووش هاتمەوە› ٥. /نظامی/ کار یان ڕەوتی پێکان و تێک‌شـکاندنی ئامێرگـەلی شـەڕی دوژمـن (وەک فرۆکـە، نـاو یـان تانـک) ٦. /گفتاری/ کـار یـان ڕەوتی کەسـێک خـستنە تۆڕەوە؛ کەسێک خستە داوەوە؛ سـەرنج ، حـەز یان هاریکاریی کەسـێک، بـەرەو خـۆ ڕاکێـشان بەتایبەت بە شێوەی ناڕەوا ‹شکار مـشتری؛ شکار شوهر: ڕاوی کڕیار؛ ڕاوی شـوو›. هـەروەها: **شـکار شدن؛ شکار کردن**

**شکار**[2]: صفت. /گفتاری/ زوێر؛ زیـز؛ وەڕەز؛ وەڕس؛ وێڕس؛ جاڕز؛ ئاراو؛ گەهراو.

▣ **شکار بودن:** /گفتـاری/ وەڕەز بوون؛ جاڕز بوون؛ قەڵس بوون؛ زویر بوون ‹آزاد از دسـت ریـسمان خیلی شکار است: ئازاد لـە دەسـت بەرپرسـەکەمان زۆر وەڕەزە›.

**شکاربان** / šekārbān، ـها؛ ـان/: اسـم. ڕاوگـەوان؛ ڕاڤگەڤان؛ پاسەوانی ڕاوگە.

**شـــکاربانی** / šekārbānî/: اسـم. ڕاوگـــەوانی؛ ڕاڤگەڤـانی؛ پاسـەوانی لـە ناوچەگـەلی ڕاو بـۆ بەرگری لە ڕاوی ناڕەوا و زێدەبەدەر.

**شکارچی** / šekārčî، ـها؛ ـان/: [فارسی/ ترکی] اسم. ڕاوچی؛ ڕاویار: ١. ڕاوکـەر؛ ڕاوچـی؛ نـەچیروان؛ نێچیرڤان؛ نچیرڤان؛ نێچیروان؛ نچیرکار؛ ڕاڤرۆ؛ ڕاڤەڤان؛ ڕاڤکار؛ سەیدەوان؛ سەیڤان؛ کەسێ کە گیانـــەوەران ڕاو دەکـــا ٢. /نجـوم/ وێنەیـــەکی ئاسمانی لە ڕۆژهـەڵاتی بیچمـی گـادا، کـە لـە ڕواڵەتی پیاوێکی گۆپاڵ وەدەست و شیر لە شان پیشان دەدرێ: **جَبّار**

**شکارگاه** / šekārgāh، ـها/: اسم. ڕاوگـە؛ ڕاڤگـە؛ ڕاوگا؛ نێچیرگـا؛ جـێ‌ڕاو؛ جـێ‌ڕاوگـە؛ شـکارگە؛ جێگەی شیاوی ڕاو کردن.

**شکارگر** / šekārgar ، ـها؛ ـان/:/اسم. ڕاوور؛ ڕاوەر؛ ڕاوچی؛ ڕاوکەر؛ ڕاڤکەر؛ گیانداریَ کە ژیانی لە ڕێی ڕاوکردندا بە ڕێوە دەچیَ و خواردەمەنی سەرەکی خۆی وا دابین دەکا.

**شکارگری** / šekārgarî/:/اسم. ڕاوچیگەری؛ ڕاوری؛ ڕاوەری: ١. کار یان پیشەی ڕاوچی ٢. قۆناغێک لە ژیانی کۆمەڵگاکانی مرۆدا کە خەڵکی بە ڕاو دەژیان.

**شکاری** / šekārî/: صفت. شکاری: ١. ڕاوی؛ پێوەندیدار یان لە بار بۆ ڕاو ٢. ڕاڤرۆ؛ ڕاوچی؛ ڕاوکەر؛ ڕاویار؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی ڕاوکردن ‹هواپیمای شکاری؛ پرندەی شکاری: فڕۆکەی شکاری؛ باڵندەی ڕاوچی›.

**شکاعی** / šokā'î/: [؟] ☜ کنگر فرنگی وحشی، **کنگر**

**شکاف** / šekāf ، ـها/:/اسم. کەل؛ کەلێن؛ درنە؛ درز؛ دەرز؛ قەڵش؛ تلیش؛ فاق؛ کەلاش؛ کەلاش؛ کەلش؛ کەڵش؛ کەلشت؛ کەڵشت؛ قەلاش؛ قلاش؛ قەڵەش؛ قەڵەشت؛ قەڵش؛ قەڵشت؛ قڵیش؛ قەرش؛ شەق؛ تڵیشە؛ چاک؛ ترەکە: ١. مەودایێ کە بە هۆی لێکبڕانی دوو بەشی شتێک یان دوو شتی پێکەوەلکاو لە نێویاندا پێک دێت ‹شکاف خوردن: کەل بوون› ٢. بۆشایی نێوان دوو مەودا ‹شکاف در:کەلێنی درگا› ٣. [مجازی] ناتەبایی؛ ناکۆکی؛ دووبەرەکی؛ نەسازیاری ‹میانشان شکاف افتاده بود: کەلین کەوتبووە نێوانیان› ٤. خمخۆرک؛ ترەک یان لێکپساوی زەوی کە درێژایی لە چەند میتر زۆرتر نەبێت.

▣ **شکاف افتادن:** [مجازی] کەلێن/کەل تیَ کەوتن؛ کەفتنە بەین؛ دووبەرەکی/ ناکۆکی کەوتنە نێوان.

**شکاف خوردن/ برداشتن:** تلیشیان؛ قەڵشان؛ قەڵشیان؛ ترەک بردن؛ درز هەڵگرتن؛ درز تیَ کەوتن؛ شەق بوون؛ شەق بردن؛ قەڵش بردن؛ وەبیەیش ‹هندوانە شکاف خورد؛ زمین شکاف برداشت: شووتیەکە تلیشا؛ زەوی قەڵشا›.

**شکاف دادن:** چاکدان؛ تلیشاندن؛ هەڵتلیشاندن؛ دڕاندن؛ هەڵدڕاندن ‹گوشەی لحاف را شکاف داد: گۆشەی لێفەکەی چاکدا›.

**شکافت** / šekāft/:/اسم. تلیش؛ قەڵەش؛ کەلشت؛ دەرز؛ دڕ؛ دڕنە؛ شکەن: ١. تیزمالک؛ چۆنیەتی تۆلاش-تۆلاش یان پەڕە-پەڕە بوونەوە ٢. کار یان ڕەوتی تلیشان؛ قەڵشان.

**شکافتگی** / šekāftegî ، ـها/:/اسم. قەڵشاوی؛ تلیشاوی.

**شکافتن** / šekāftan/: مصدر. متعدی. لازم. // **شکافتی:** قەڵشاندت؛ **می‌شکافی:** دەقەڵشێنی؛ **بشکاف:** بقەڵشێنە// ☐ متعدی. ١. قەڵشاندن؛ قڵیشاندن؛ قەلاشتن؛ قەلاشدن؛ ڤەقەلاشتن؛ قلاشتن؛ کەلاشتن؛ تلیشاندن؛ داتلیشاندن؛ داقەڵشاندن؛ پەرچڤاندن؛ دڕین؛ دادڕین؛ هەڵتلووفانن؛ دڕدان؛ دەرزاندن؛ وەکەردش؛ دڕندەی؛ ترەکنەی؛ ترەکنای؛ ئشکاوەی؛ شکاوای؛ تلیشنەی؛ تلیشنای؛ قەڵش دە شتێک بەدیهێنان ‹شکافتن دیوار؛ شکافتن جمعیت: قەلاشتنی دیوار؛ دڕدانی ئاپۆرە› ٢. هەڵتلیشاندنەوە؛ قڵیشانەوە؛ تلیشاندنەوە؛ هەڵدڕاندن؛ هەڵتەکاندنەوە؛ هەڵتەکانن؛ هۆرتەکنەی؛ هۆروەتەکنەی؛ هۆرتەکنایوە؛ هەڵوەشاندنەوەی دروومان یان درزێک ‹لحاف را شکافتن: لێفە هەڵتەکاندنەوە› ٣. بشکافتن؛ قڵیشاندنەوە؛ هەڵوەشاندنەوە؛ هەڵتەکاندنەوە؛ هۆرەوەتەکنەی؛ چنراوەیەک دیسانەکە کردنەوە بەن ‹کلاه بافتنی را شکافت تا از کاموایش دستکش ببافد: کلاوەکەی هەڵوەشاندەوە تا لە کاموا کەی دەسەوانە بچنیَ› ٤. [مجازی] کولکوموش کردنەوە؛ شی کردنەوە؛ ڕاڤەکردن؛ هلکەواشتن؛ هلکەوشاندن؛ تا و توکەردەی؛ توێژینەوە؛

تاوتوێی شتێک دەرهێنان ‹بحث را شکافتن›؛ مشکل را شکافتن: شی کردنەوەی باس؛ کولک‌ومووش کردنی گرفت› □لازم. ۵. درز بردن؛ قەرشیان؛ قڵیشیان؛ قەرش بردن؛ قەڵشان؛ تلیشان؛ قەڵشین؛ کەلشین؛ پەرچقین؛ ترەکیەی؛ ترەکیای؛ ئشکاویەی؛ تڵیشیەی؛ تڵیشیای؛ شەق بردن؛ هەڵترەکان؛ قەرشان؛ قەڵش دە شتێک بەدیهاتن ‹یخ زیر پایش شکافت: سەهۆلی ژێر پای قەڵشا›. هەروەها: **شکافتنی**

■ صفت فاعلی: **شکافنده** (قەڵشێنەر/ ــ)/ صفت مفعولی: **شکافته** (قەڵشێنراو/ قەڵشاو)/ مصدر منفی: **نشکافتن** (نەقەڵشاندن/ نەقەڵشان)

**شکافته**/šekāfte/: *صفت*. کەلاشتی؛ کەلاشتی؛ قەلاشتوو؛ قەڵشاو؛ کەفتە؛ قەڵشیو؛ قەڵشیاگ؛ قەرشاو؛ قڵیشاو؛ تڵیشیاگ؛ تڵیشاو؛ تڵیشیا؛ ئشکاویا.

▣ **شکافته شدن:** قەلەشان؛ قڵیشان؛ قەڵشان؛ درز بردن؛ تڵیشیان؛ قەلاشین؛ قەڵشین؛ پەرچقین؛ قلیشانەوە؛ تڵیشیەی؛ تڵیشیای؛ ترەک واردەی ‹سنگ خورد به سرش، ۱۰ سانت شکافته شد: بەرد دای لە سەری، ۱۰ سانت قەلەشا›.

**شکاک** / šakkāk ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت*. دڕدۆنگ؛ دوودڵ؛ بەگومان ‹خیلی شکاک است، حرف هیچ کس را باور ندارد: زۆر دردونگە، بڕوای بە قسەی کەس نیە›.

**شکاکیت** / šakkākîyyat ، ـها/: [عربی]/*اسم*. ۱. دوودڵی؛ بەگومانی؛ دڕدۆنگی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دوودڵ بوون ۲. ئایینێ کە شارەزایی ڕاستەقینە یان تەواو لەمەڕ بابەتێکەوە بە ئەستەم و بەڵکوو نەگونجاو دەزانێ.

**شکال** / šekāl/: [عربی]/*اسم*. سندم؛ پێوەن؛ پێوەندی ئاسنین؛ پێبەندی ئاسنین.

**شکاندن** / šekāndan/: *مصدر. متعدی [گفتاری]* شکاندن؛ شکانن؛ هڕاندن؛ مارتەی.

**شکایات** / šekāyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **شِکایَت**

**شکایت** / šekāyat ، ـها؛ شکایات/: [عربی]/*اسم*. ۱. گازە؛ گازندە؛ داد؛ شکات؛ شکایەت؛ گێرە؛ گەڕە؛ ئەوەی لەمەڕ ستەم یان خراپەکاری کەسێ یان خراپی شتێکەوە، بۆ داخواستنی ڕێگەچارە و باربووکردنەوەی دەگوترێت ‹مردم از مسئولان شکایت داشتند: خەڵک لە بەرپرسان گازەیان هەبوو› ۲. هانا؛ گازندە؛ گەڕە؛ داد؛ شکایەت؛ شکات؛ داوخوازی؛ داخوازی ‹برای گرفتن پولم شکایت کردم: بۆ وەرگرتنەوەی پارەکەم شکاتم کرد› ۳. گلەی؛ گلەیی؛ سکاڵا؛ وتەیێ کە نیشانەی دڵ ئێشان یان نارەزامەندیە ‹از وضع زندگی‌اش شکایت داشت: لە بار و دۆخی ژیانی گلەی هەبوو›. هەروەها: **شکایت داشتن؛ شکایت کردن**

**شکایت‌نامه** / šekāyatnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی] /*اسم*. سکاڵانامە؛ دادنامە؛ دادخوازنامە؛ شکاتنامە.

**شکر** / šekar, šakar/: [سنسکریت]/*اسم*. شەکر؛ شەکەر؛ ماکێکی بلۆری شیرین و بێ‌ڕەنگ یان سپیە کە لە نەیشەکەر یان چۆنەری قەند دروست دەکرێ و پالێوراوەکەی بە شێوەی دانەـ دانەی شەکر یان کەڵلەی قەند دێتە بازاڕەوە.

▣ **شکر سرخ:** شەکری سوور: ۱. شەکری پاڵفتە نەکراو ۲. ماکێ کە لە کوڵاندنی شەکر یان قەندی سپی بەدی دێت.

**شکر** / šokr/: [عربی]/*اسم*. سپاس؛ سوپاس؛ شکر؛ شوکر.

▣ **شکر کردن:** شوکرکردن؛ سپاس کردن؛ نیشاندانی پێزانین و ئەمەگناسی خۆ دەرحەق چاکەی کەسێکی تر، بەتایبەت خودا.

**شکر گفتن:** شوکرانەبژێری کردن؛ سپاس کردن؛ سوپاس بەجێ‌هێنان.

**شکراب** / šekarāb, šakar-/: [سنسکریت/ فارسی] /*اسم*. شەکراو؛ شەکەراوە؛ قەنداو؛ شەربەتی شەکر

و ئاو به گولاو یان بیمشکەوە.

▣ **شکراب شدن میانه:** */مجازی/* نێوان شەربەت بوون؛ نێوان ناخۆش بوون؛ نێوان تێکچوون؛ تێکچوونی پێوەندی نێوان دوو کەس لە سۆنگەی لێک ڕەنجیانەوە ‹چند روز است که میانەشان شکراب است: چەند ڕۆژێکە نێوانیان شەربەتە›.

**شکرانه** / šokrāne/: [عربی/ فارسی]/اسم. شوکرانە؛ شوکرانەبژێری؛ کارێ کە بۆ سپاس بەجێهێنان و پێزانین دەکرێت ‹شکرانەی سلامت: شوکرانەی ساغی›.

▣ **به شکرانەی چیزی:** بە شوکرانەی شتێک؛ بۆ سپاس کردن بە بۆنەی شتێکەوە ‹به شکرانەی پیروزی ورزشکاران: بە شوکرانەی سەرکەوتنی وەرزشکاران›.

**شکربار** / šekarbār, šakar-/: [سنسکریت/ فارسی] صفت. /ادبی/ شەکراوی؛ زۆر شیرن و خۆشچێژە.

**شکرپاره** / šekarpāre, šakar-/: [سنسکریت/ فارسی] اسم. /مجازی/ شەکرەسێو؛ شەکەرەسێو؛ شەکەرەسێف؛ قەندهەنگوێن؛ هەر شتێکی زۆر شیرین و بە زار خۆش.

**شکرپاش** / šekarpāš, šakar-، ـها/: [سنسکریت/ فارسی] اسم. شەکرپاش؛ شەکردان؛ شەکەردان؛ دەفرێکی چکۆلە بە سەرێکی کون‌ـکونەوە بۆ شەکر داکردن.

**شکرپنیر** / šekarpanîr, šakar-، ـها/: [سنسکریت/ فارسی] اسم. شەکەرپەنێر؛ شەکرپەنیر؛ جۆرێ نوقڵ لە شەکر، ئارد و بۆنخۆشجات.

**شکرخند** / šekarxand, šakar-، ـها/: [سنسکریت/ فارسی] اسم. /مجازی/ بسکە؛ شەکەرخەن؛ شەکرخەن؛ شەکرخەنە: ١. بزەی بە خوشی؛ پێکەنین لە ڕووی شایی و سەرخۆشیەوە ٢. پێکەنینی جوان و دلبزوێن.

**شکرخواب** / šekarxāb, šakar-/: [سنسکریت/ فارسی] اسم. /مجازی/ شیرین‌خەو؛ شیرین‌وەرم؛ خەوی خۆش و دلگر.

**شکردان** / šekardān, šakar-، ـها/: [سنسکریت/ فارسی] اسم. شەکەردان؛ شەکردان: ١. دەفری جێ شەکر ٢. شەکرپاش؛ دەفری شەکر داکردن.

**شکرسخن** / šek(k)arsoxan, šak(k)ar-/: [سنسکریت/ فارسی] صفت. /ادبی/ مجازی/ شەکرلێف؛ شەکرشکێن؛ شەکرلێو؛ قسەخۆش؛ قسەوەش؛ قسەشیرین؛ قسەجوان؛ گفت‌خۆش؛ لفت ڕەوان ‹طوطیان شکرسخن شیرین گفتار: تووتیگەلی قسەخۆشی شیرین وتار›.

**شکرک** / šekarak, šakarak، ـها/: [سنسکریت/ فارسی] اسم. شەکەرەک؛ دەنکەورتکەی بلۆری قەند کە بە هۆی هەندێ هۆکاری فیزیکی یان کیمیاییەوە لە برێک تراوی شیریندا بەدی دێ.

▣ **شکرک زدن/ بستن:** شەکەرەک دان؛ پەیدا بوونی دانەگەلی بلۆری لە تراوێکدا کە ماکی قەندی تێدایە یان بلۆری بوونی ئەو ماکە ‹سر مربا را باز نگذار، شکرک می‌زند: سەری مرەباکە تاک مەکە، شەکەرەک دەدا›.

**شکرگزار** / šokorgzār/: [عربی/ فارسی] صفت. شوکرانەبژێر؛ پێزان؛ بەجێهێنەری سپاس ‹تمام عمر شکرگزار محبت شما خواهم بود: تا ماوم شوکرانەبژێری چاکەتان دەبم›.

**شکرگزاری** / šokrgozārî، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. شوکرانەبژێری؛ شوکرانە؛ کار یان ڕەوتی شوکرکردن یان سپاسی خۆ نیشاندان ‹کشاورزان به خاطر بارندگیهای اخیر شکرگزاری کردند: وەرزێران بە بۆنەی بارشتی ئەم دواییانەوە شوکرانەبژێریان بە جێهێنا›.

**شکری**[1] / šekarî, šakarî/: [سنسکریت] اسم. شەکەری؛ شەکری؛ ڕەنگی زەردی ئاماڵ سوور. هەروەها: **شکری‌رنگ**

**شکری**[2]: صفت. شەکری؛ شەکەری: ١. بە ڕەنگی

زەردی ئاماڵ سوور ٢. شەکەردار؛ بە شەکرەوە ‹حلواشکری؛ هەڵواسەکەری›.

**شکرین** / šekarîn, šakarîn/: [اسنسکریت/ فارسی] *صفت. //ادبی//* شەکرین؛ شەکەرین: ١. شەکراوی؛ تێکەڵ بە شەکرەوە ٢. زۆر شیرین و لەبەردڵ ‹خندەی شکرین؛ بوسەی شکرین: بزەی شەکرین؛ ماچی شەکەرین›.

**شکست** / šekast ، ـها/: *اسم.* شکست؛ شکەست: ١. شکاوی؛ شەکاوی؛ شکیاگی ‹شکست برداشتن: شکست تێکەوتن› ٢. بە ئاکام نەگەیشتن لە بەڕێوەبردنی کارێک یان نەگەییشتن بە شتێک ‹شکست از عشق؛ شکست در تجارت: شکەست لە ئەوین؛ شکەست لە بازرگانی› ٣. کار یان ڕەوتی دۆڕاندنی ململانێ یان شەڕ؛ دانان؛ نیایره. بەرانبەر: **پیروزی** ‹شکست ورزشی؛ شکست جنگی: شکەستی وەرزشی؛ شکستی جەنگی›.

▣ **شکست نور:** داشکانی تیشک؛ گۆڕانی ڕێگەی تێپەڕینی نوور لە ماکێکی تەنکەوە بۆ شتێکی خەست.

▣ **شکست برداشتن:** درز بردن؛ زەنگ بردن؛ شکست تێکەوتن؛ ترەکین؛ ترەکیان؛ ترەک واردەی ‹دیوار از دو جا شکست برداشت: دیوارەکە لە دوو لاوە درزی برد›.

**شکست خوردن:** شکست خواردن؛ دانان؛ بەزان؛ بەزین؛ وەزین؛ دانیان؛ شکان؛ تێشکان؛ کۆڵدان؛ ئەرەنیەی؛ نیایره؛ بە ئامانج و داخوازی خۆ نەگەییشتن ‹دشمن شکست خورد؛ در مسابقه شکست خوردم: دوژمن شکستی خوارد؛ لە کێبەرکێدا دامنا›: **شکست یافتن**

**شکست دادن:** شکست پێدان؛ بەزاندن؛ تێشکاندن؛ بەزانن؛ بەزنەی؛ بەزنای؛ کۆڵ پێدان؛ بە سەر دوژمن یان هاوبەردا سەرکەوتن ‹حریف را شکست داد؛ بیماری را شکست داد: هاوبەرەکەی بەزاند؛ نەخۆشینەکەی تێشکاند›.

**شکست یافتن** ☜ **شکست خوردن**

**به شکست انجامیدن:** سەر نەکەوتن؛ ئاخر نەهێنانەوە.

**شکست‌خورده** / šekastxorde ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* بەزیو؛ بەزیاگ؛ بەزیا؛ تێشکاو؛ تێکشکاو؛ ئشکیاگ؛ وە بەر شکست یان ناکامیەوە کەوتوو؛ شکستە ‹عاشق شکست‌خوردە؛ سپاه شکست‌خوردە: گراوی بەزیو؛ سوپای تیشکاو›.

**شکستگی** / šekastegî ، ـها/: *اسم.* ١. شکاوی؛ شکاویەتی؛ کەل؛ دۆخ یان چۆنیەتی لێ بوونەوەی یەک یان چەند بەشی شتێک یان پەیدا بوونی درز یان قەڵش بە هۆی گوشار یان لێدانەوە ‹شکستگی استخوان: شکاوی ئێسک› ٢. */مجازی/* داشکاوی؛ تێشکاوی؛ ژاکاوی؛ لە دەست دانی پاراوی و لەش‌ساغی ‹آثار شکستگی در چهره و قامتش هویدا بود: شوێنەواری شکاوی لە سیما و بالایدا دیار بوو›.

**شکستن** / šekastan/: *مصدر. متعدی. لازم.* // **شکستی:** شکاندت؛ **می‌شکنی:** دەشکێنی؛ **بشکن:** بشکێنە// ◻ *متعدی.* ١. شکاندن؛ شکانن؛ شکەناندن؛ شکەستن؛ شکیناندن؛ شکێناندن؛ ئشکەنن؛ هەرستین؛ هەرستاندن؛ هەرساندن؛ هەرشاندن؛ پاژ-پاژکردن؛ هڕاندن؛ قەرساندن؛ تووتووخاندن؛ دەرزاندن؛ مارەی؛ مارای؛ مارتەی؛ مەڕدەی؛ لێک کردنەوەی شتێک بە گوشار یان لێدان ‹شیشه را شکستن؛ صندلی را شکستن: شووشە شکاندن؛ ئەسکەملە شکاندن› ٢. */مجازی/* شکاندن؛ شکانن؛ شکەناندن؛ ژێر پا نان؛ سەر با دان؛ مارەی؛ مارای؛ مارتەی؛ گوێ نەدان و یاخی بوون ‹قانون را شکستن؛ حرمت کسی را شکستن: قانون شکاندن؛ ڕێزی کەسێ نانە ژێر پا› ٣. شکاندن؛ شکانن؛ شکەناندن؛ بڕین؛ مارەی؛ مارای؛ مارتەی؛ بە ناتەواوی هێشتنەوەی شتێک ‹قول خود را شکستن؛ نماز را شکستن: بەڵێنی خۆ شکاندن؛ نوێژ برین› ٤. */مجازی/* شکاندن؛ شکانن؛

شکەناندن؛ بەزاندن؛ بەزنەی؛ بەزنای؛ مارەی؛ ماڕای؛ مارتەی؛ تێکشکاندن ‹دشمن را شکستن: دوژمن بەزاندن› ٥. شکاندن؛ شکانن؛ شکەناندن؛ ئاراندن؛ ئازراندن؛ ڕەنجاندن؛ مارەی؛ ماڕای؛ مارتەی؛ دڵ ئێشاندن ‹دل کسی را شکستن: دڵی کەسێک شکاندن› ٦. تووکاندن؛ داشکاندن؛ تەقاندن؛ مارەی؛ ماڕای؛ مارتەی؛ ئەرەمارەی؛ ئەرەمارتەی؛ مارتەیرە؛ دە توێکڵ دەرهێنانی کاکڵەی میوە ‹تخمە شکستن: تۆم تووکاندن› ☐ *لازم.* ٧. شکان؛ شکیان؛ ئشکیاین؛ داقولین؛ لەت بوون؛ ورد و خاش بوون؛ دەرزیەن؛ شکەستن؛ شکین؛ تووتووخین؛ مریەی؛ مەڕیای ‹شیشه شکستن؛ صندلی شکستن: شووشە شکان؛ سەندەڵی شکیان› ٨. شکان؛ شکیان؛ مریەی؛ لە ناو چوون ‹سکوت شکستن: بێدەنگی شکان› ٩. شکان؛ شکیان؛ هندکین؛ کەم بوونەوە؛ مریەی ‹سرما شکستن؛ قیمت شکستن: سەرما شکان؛ نرخ شکیان›. هەروەها: **شکستنی**

■ صفت فاعلی: **شکننده** (ــ)/ صفت مفعولی: **شکسته** (شکێنراو/ شکاو)/ مصدر منفی: **نشکستن** (نەشکاندن/ نەشکان)

**شکستناپذیر** / šekastnāpazîr ، ـها؛ ـان/: *صفت.* کۆڵنەدەر؛ نەبەز؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی ڕاوەستان لە بەرانبەر دوژمن یان دژواریەوە، هەتا لە نێو چوونیان ‹ارتش شکستناپذیر؛ ارادەی شکستناپذیر: سپای کۆڵنەدەر؛ ویستی نەبەز›.

**شکسته**[1] / šekaste/: *اسم.* شکستە؛ یەکێک لە خەتەکانی فارسی کە لە دەسنووس، بەتایبەت لە نامە نووووسیندا بە کار دێت ‹وقتی شکسته مینویسی درست خوانده نمیشود: کاتێ شکستە دەنووسی باش ناخوێندرێتەوە›: **خط شکسته**

**شکسته**[2]: *صفت.* ١. شکاو؛ شکەستی؛ شکیاو؛ شکیاگ؛ کەل؛ کەلە؛ مریا؛ مریەی؛ لەتبوو؛ شکێندراو ‹کوزەی شکسته: گۆزەی شکاو› ٢. *[مجازی]* ژاکاو؛ داشکاو؛ ئەوەمریا؛ بێبەش لە لەشساقی و پاراوی، بە هۆی نەخۆشین و پەککەوتەیی یان بە هۆی پەژارەی زۆرەوە ‹چهرەی شکسته: چاری ژاکاو› ٣. *[مجازی]* خەمبار؛ خەمگین؛ ڕەنجاو؛ گەهراو ‹دلشکسته: دڵشکاو›. هەروەها: **شکسته شدن**

**شکستەبسته** / šekastebaste/: *صفت.* سەروپا شکاو؛ سەروپا شکیاگ؛ دەسوپا شکیاگ؛ چەکوەک؛ چەکنتی؛ بە ناتەواوی، کەم و کۆڕی یان هەڵە لە پێکهاتەی ڕستەدا ‹با انگلیسی شکستهبستهای به او فهماندم که میخواهم سوار قطار بشوم: بە ئینگلیزیێکی سەروباشکاو تێمگەیاند دەمەوێ سواری قەتار بم›.

**شکستەبند** / šekasteband ، ـها/: *اسم.* کەل؛ شکستەبەند؛ هەڵبەس؛ هەڵبەست؛ هەستیگرەک؛ ئێسکگرەوە؛ شکست هەڵبەست؛ جەڕڕاح؛ کەسێ کە ئێسکی شکاو یان لە جێچووی گیانەوەرێک دەخاتە جێگە و دەیبەستێ کە بگیرسێتەوە.

**شکستەبندی** / šekastebandî/: *اسم.* شکستەبەندی؛ گرتنەوە؛ هەستیگری؛ کار یان ڕەوتی کەلدان؛ خستنەوە جێی ئێسقانی شکاو یان لەجێ دەرچووگ.

**شکستەخاطر** / šekastexāter/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[مجازی، ادبی]* دڵشکاو؛ دڵتەزیو؛ دلڕەنجیاگ؛ دلڕەنجاو؛ تووشیاری خەم و پەژارە بەهۆی ناکامیەوە.

**شکستەدل** / šekastedel/ ☜ **دلشکسته**

**شکستەنفس** / šekastenafs/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[مجازی]* خاکەسار.

**شکستەنفسی** / šekastenafsî ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* *[مجازی]* خاکەساری؛ کار یان ڕەوتی بێبایەخ نیشاندانی پلەوپایە و لێهاتوویی خۆ ‹او بیش از همەی ما در این زمینه اطلاعات دارد، اما شکستهنفسی میکند: لەم بوارەدا ئەو لە هەموومان شارەزاترە، بەڵام خاکەساری دەکا›.

**شـــکفتن** / šekoftan/: مـصدر. لازم. // **شـــکفتی:** شکۆفیایەوە؛ **می‌شـکفی:** دەشـکۆفیەوە؛ **شکوفاشـو:** بـــشکۆفەوە// شـــکۆفیانەوە؛ شـــکۆفانەوە: ١. پـشکووتن؛ پـشکوتن؛ دەمدانـەوە؛ کرانـەوە؛ پشکفتن؛ پشکڤین؛ بشکفتن؛ پشکووان؛ ڤەبوون؛ گۆترەکان؛ گۆترەکین؛ ئەوەتەنگیەی/ تنگیـەی؛ شکۆفەکردن؛ فنچقان؛ کرانەوەی گوڵ یان لکـی داران لـە یـەکتری ‹شـکفتن غنچـە: پـشکووتنی خونچـە› ٢. گەشـانەوە؛ گەشـیانەوە؛ گـەش بوونـەوە؛ گەشـیان؛ گەشـینەوە؛ خـیڤ بـوون؛ بایباڵدان؛ گەشە سەندن؛ گەشەکردن؛ هەرەش بیەی؛ گەیشتن بە ئاستی پێشکەوتن. هەروەها: **شکفتنی**

■ صفت مفعولی: **شکفته** (شـکۆفاو)/ مـصدر منفـی: **نشکفتن** (نەشکۆفانەوە)

**شکل** / šekl، ـها/: [عربـی]/اسم. ١. بـیچم؛ مـەوژ؛ تەشک؛ دیامان؛ نژم؛ دیمەن؛ شـکڵ؛ پێکهاتـەی دەرەکی شتێک ‹شکلش مرا به یاد کورەی آجرپـزی انـداخت: بیچمـی مـنی خـستەوە بـیری کـوورەی ئاجورپەزی› ٢. / اشکال/ کێم؛ وێنە؛ بیچم؛ شکڵ؛ مەوژ؛ شـێوە؛ وێنـەی هیندسـی (وەکـوو خـەت، سێ‌گۆش، گـۆ) ٣. وێنـە؛ بـیچم؛ دیـدار؛ شکـڵی شتێک ‹این شکل اسب است: ئەمە وێنـەی ئەسـپە› ٤. *[گفتاری]* سەروسەکوت؛ بیچم؛ کێم؛ قەلافەت؛ لەس‌پێت؛ تووز؛ دیامان؛ دیـدار؛ شـێوە؛ بـەچک ‹نمی‌خواهم شکلش را ببینم: نامـەوێ سەروسەکوتـی ببیـنم› ٥. *[گفتـاری]* وێنـە؛ وەک؛ هـەر وەکـوو؛ دیامان؛ شێوە؛ قام؛ کوت‌ومت ‹قیافەاش شکل دیـو بود: سەروسەکوتی وێنەی دێو بوو›.

▣ **شکل دادن:** ١. شێوە پێ‌دان؛ بـیچم پـێ‌دان؛ شکڵ پێ‌دان؛ بە شـێوازی دڵـخواز و ویـستی خـۆ دەرهێنـان ‹بـە تـودەی گـل شـکل مـی‌داد: تۆپەڵەی قوڕی شـێوە پـێ‌دەدا› ٢. ڕێ‌خـستن؛ پێک‌هێنان ‹آزاد این مهمانی را شکل داد: ئازاد ئەم میوانیەی ڕێ‌خست›. هەروەها: **شکل بخشیدن**

**شکل کسی/ چیزی بودن:** شێوەی کەسێ یان شـتێک بـوون؛ وێنـەی کەسـێ یـان شـتێک بوون؛ لە شتێ/ کەسێ چوون؛ وەکوو کەسـێ یان شتێک بوون ‹شکل میمـون اسـت: شـێوەی مەیموونە›.

**شکل کسی/ چیزی را کشیدن:** شێوە/ وێنـەی کەسێ یان شتێک کێشان ‹توی دفتـرش شـکل یک دختـر را کـشیده بـود: لـە نێـو دەفتەرەکەیـدا وێنەی کچێکی کیشابوو›.

**از شکل افتادن:** ڕەنـگ و ڕوو دانـان؛ ڕواڵـەت نەمان ‹سارا خیلی از شکل افتاده بود: سارا گـەلێک ڕەنـگ و ڕووی دانـابوو›. هـەروەها: **از شـــکل انداختن**

**بـە شـکل کـسی/ چیـزی در آوردن:** وەکـوو کەسێ/ شتێک لێ کردن؛ بە وێنەی کەسـێ/ شتێک دەرهێنان؛ بە شێوەی کەسێ/ شـتێک دەرهێنان ‹خودش را به شکل هیپی‌ها درآورده بود: خۆی وەکوو هیپیەکان دەرهێنا بوو›.

**شکلات** / šokolāt, šukulāt، ـها/: [فرانسوی]/اسم. چکلیتی؛ چیقلاتە؛ چکلیت؛ شـوکلات؛ جۆرێـک شیرینی کە لە کاکائوو و شەکر (جار و باریش لـە شتانی‌تر وەکوو شیر، پستە و بـەهارات) دروسـتی دەکەن: **شوکولات**

**شکلاتی**[1] / šokolātî, šûkûlātî، ـها/: [فرانسوی] /اسم. کەمکۆڵـی؛ شـوکلاتی؛ ڕەنگـی شـوکلات؛ ڕەنگی شیرکاکائوو؛ ڕەنگی قاوەیی خۆڵەمێـشی بـە تـۆزێ هـەوێنی سـوورەوە. هـەروەها: **شکلاتی‌رنگ**

**شکلاتی**[2]: *صفت.* شـوکلاتی: ١. کەمکۆڵـی؛ بـە تایبەتمەندی ڕەنگی شـوکلاتی ٢. تێکـەڵاو بـە شوکلاتەوە ‹کیک شکلاتی: کەیکی شوکلاتی›.

**شـــکلپذیر** / šeklpazîr/: [عربـی/ فارسـی] *صفت.* شێوەگر؛ بیچم‌گر؛ لەبار بۆ هاتنە باری دڵـخواز و دیاریکراو (وەکوو ماکی هەویری).

**شـــکلپذیری** / šeklpazîrî/: [عربـی/ فارسـی]/اسم.

شێوەگری؛ بێچمگری؛ دۆخ یان چۆنیەتی شێوەگر بوون.

**شکلک** / šeklak ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. چیڕ؛ کاری با دانی دەم و چاو لە کاتی نواندنی نارەزایەتی، لالووت بوون یان تیز پێکردندا.

▣ **شکلک درآوردن:** ڕوو بادان؛ چیڕ کردنەوە ‹بچەها برایش شکلک در می‌آوردند و او دنبالشان می‌کرد: منداڵان ڕوویان بۆ با دەدا و ئەو ڕەدوویان دەکەوت›.

**شکل‌گیری** / šeklgîrî/: [عربی/ فارسی]/اسم. گرسان؛ گیرسان؛ گیرس؛ گرس؛ ڕەوتی پێکهاتن؛ کار و ڕەوتی پەیدا بوونی دیامان یان حاڵەتی دیاریکراو ‹شکل‌گیری سازمانهای دانشجویی: گرسانی ڕێکخراوەگەلی خوێندکاری›.

**شکل‌وشمایل** / šekl-o-šamāyel/: [عربی]/اسم. [گفتاری] قەوارە؛ شێوە؛ ڕەنگ و ڕوو؛ شێواز؛ چار؛ وێنە و چۆنیەتی بێچم ‹مردی بود به شکل‌وشمایل شما، اما کمی بلندتر: پیاوێک بوو لە قەوارەی ئێوە، بەڵام هێندێ بەرزتر›.

**شکم** / šekam/: /اسم. زگ؛ زک؛ سک؛ گەدە؛ لەمگدە؛ لەمە: ١. ـها/ لم؛ تل؛ شوولەم؛ ورگ؛ بەشێ لە لەشی گیانداری مۆرغەدار لە نێوان سنگەوە تا هێت ٢. [مجازی] کۆندامی هەرسەک ‹شکمم خوب کار نمی‌کند: زگم باش کار ناکا› ٣. بەشی پاشووی لەشی مێروان ٤. [گفتاری] بەشی زۆپ و دەرپەڕیوی هەرشتێ (وەک شووشە و گۆزە) ٥. [گفتاری] جاری زاوزێ ‹هفت شکم زایید: حەوت سکی بوو› ٦. [گفتاری] ناوسک؛ ناوەوە و دەروونی شتێ.

▣ **شکم پر:** زگی پڕ؛ لەمێ پەڕە: ١. سکێ کە لە خۆراک پەستاوە. بەرانبەر: **شکم خالی** ‹با شکم پر ورزش نکن!: بە زگی پڕەوە وەرزش مەکە!› ٢. [کنایی] ئاوس؛ زگپڕ؛ لەمەپەڕە.

**شکم خالی:** زگی خاڵی؛ لەمێ هاڵیە؛ سکێ کە خۆراکی تێدا نیە. بەرانبەر: **شکم پر** ‹با شکم خالی که نمی‌توانم کار کنم: بە زگی خاڵی ناتوانم کار بکەم›.

▣ **شکم از عزا درآوردن:** [مجازی] زگ لەوەڕاندن؛ تێر و پڕ خواردن؛ زک بەردان؛ خۆ تێر و تەسەل کردن؛ خۆ مڕکردن بە خۆراکی خۆش ‹دیشب بعد از مدتی حاضری خوردن شکمی از عزا درآوردم: دوێنێشەو پاش ماوەیەک حازری خواردن زگێکم لەوەڕاند›.

**شکم به قاروقور افتادن:** قۆڕەی زک هەڵسان؛ قۆڕەی زک هاتن؛ برسی بوون؛ ئاورا بیەی ‹شکمم به قاروقور افتاده، زود باش غذا را بکش!: قوڕەی زگم هەڵسا، خێرا کە چێشتەکە داکە!›.

**شکم خود را صابون زدن:** [مجازی] زک تاودان؛ بە هیوای شتێک بەتایبەت خواردەمەنی بوون ‹بی‌خود شکمت را صابون نزن، از ناهار خبری نیست: بێخۆ زکت تاو مەدە فراوێنمان نیە›: **صابون به شکم خود زدن**

**شکم دادن:** زک دان؛ زگ داین؛ سک دان؛ کوپ دان؛ لەم دەی/ دای؛ دەرپەڕینی بەشی ناوەڕاستی شتێک بە هۆی خراپیەوە ‹شکم دادن دیوار؛ شکم دادن سقف: زک دانی دیوار؛ زک دانی میچ›.

**شکم کار کردن:** زک کار کردن؛ دوورەوە خستنی پیسایی ڕیخۆڵە ‹شکمت کار می‌کند؟: زکت کار دەکا؟›. هەروەها: **شکم کار نکردن**

**شکم کسی بالا آمدن:** [کنایی] سکی کەسێ پڕ بوون؛ زگی کەسێ پڕ بوون؛ لەمەپەڕ بیەی؛ ئاوس بوون.

**شکم کسی به پشت چسبیدن:** [مجازی] زگی کەسێک بە پشتیەوە نووسان؛ زگی کەسێک قوپان؛ پەراسووی کەسێ کەفتنە دەشتەوە؛ لەمۆ یۆی ئەنەورێ لوەی؛ لە بەر برسێتی زۆر لاواز بوون ‹بس که چیزی نخورده شکمش به پشتش چسبیده: ئەوندە هیچی نەخواردووە زگی بە پشتیەوە نووساوە›.

**شکم کسی را سفره کردن:** */مجازی/* زگی کەسێ هەڵدڕین؛ لەمۆ یۆی کاردەوەژێ کەردەی ‹با چاقو شکمش را سفره کردند: بە چەقۆ زکیان هەڵدری›.

**شکم کسی سیر بودن:** زگی کەسێک تێر بوون؛ لەمۆ یۆی سێر بیەی: ۱. تێر بوون؛ سێر بیەی ۲. */کنایی/* دەوڵەمەند بوون؛ باری ئابووری و ژیواری کەسێ لەبار بوون ‹تا شکم کسی سیر است، این حرفها را نمی‌فهمد: تا زگی کەسێک تیرە، لەم قسانە تێ‌ناگا›.

**شکمباره** / šekambāre ، ـها؛ ـگان/: صفت. */ادبی/* نەوسن؛ کولب؛ چلێس؛ چلێز؛ چلێک؛ چل‌وفل؛ چڵ؛ نوشگل؛ کولافی؛ زگ‌لەوەڕێن؛ بیلۆ؛ دەریالووش؛ حەفی؛ سک‌بەر؛ زۆرخۆر؛ چەورە؛ نەفسەک؛ زکین؛ زکوون؛ زکوونی؛ تێرنەخۆر؛ حەف‌حەفی؛ کولبەوی؛ کوڕ؛ عوورمەرن؛ مووشەک؛ مووشەکەر؛ گەدگن؛ هەڵمەتەکاسە؛ پووقەک؛ فرەخۆرە و خوازەڵۆکی خواردن: **شکم‌پرست؛ شکم‌پرور؛ شکمچران**

**شکمبند** / šekamband ، ـها/: اسم. سکوێن؛ سکبەن؛ شالێکی پانی پارچەیی بە بەند و سەگەکێکەوە بۆ بەرگری لە شل بوونەوەی ماسوولکەی زگ یان دامرکاندنی دەرپەڕیوی سک.

**شکمبه** / šekambe ، ـها/: اسم. ورگ؛ گرش؛ کرش؛ کەرش؛ مەشک؛ هێلگ؛ ئاشک؛ هۆلمان؛ عوور؛ عووێر؛ عوێرگ؛ گیپاڵ؛ هێرک؛ گاوک؛ گرگ؛ حورگ؛ گەدە؛ مەدە؛ گەدگ؛ گەگگ؛ گاگ؛ گەییە؛ گەدەق؛ گەد؛ هووری؛ ئەشقەمە؛ گیە؛ گەڵە؛ یەکەمین و گەورەترین بەشی گەدەی کاوێژکەران.

**شکم‌پرست** / šekamparast/ ☜ **شکمباره**

**شکم‌پرکن** / šekamporkon/: صفت. زک‌تێرکەر؛ بە بایەخی کەمی بژیوی و جێ‌گرتنەوەی زۆرەوە.

**شکم‌پرور** / šekamparvar/ ☜ **شکمباره**

**شکمچران** / šekamčarān/ ☜ **شکمباره**

**شکمچرانی** / šekamčarānî ، ـها/: اسم. زگ‌لەوەڕێنی؛ سک‌چەرێنی؛ هەفهەفیاتی؛ چلێسی؛ چەورەیی؛ زکوونی؛ کار یان ڕەوتی خواردنی خواردەمەنی جۆراوجۆر بە مەبەستی چێژە وەرگرتن (نەک بۆ تێر بوون).

**شکمچه** / šekamče ، ـها/: اسم. ناوزک؛ ناوسک؛ هەناو؛ زگۆڵە.

**شکم‌درد** / šekamdard/ ☜ **درد**[2]

**شکم‌روش** / šekamraveš/: اسم. زکەشۆڕە؛ زکەشۆرێ؛ بەلەفیرە؛ تەقەفیرکە.

**شکم‌گنده** / šekamgonde ، ـها/: صفت. */گفتاری/* خلۆخە؛ مەشکن؛ ورگن؛ زگ‌زل؛ مەشکۆ؛ مەشکوێ؛ تۆراغدان؛ تەلێر؛ گەدگن؛ تەلێر؛ دەفزگ؛ کرشە؛ زک‌بەل؛ تەنگەئەستوور؛ ورگنە؛ ورگە؛ سێ‌تەنگە؛ هورگن؛ هورگنە؛ خینگە؛ خاوەن زگی زل و هەڵماسیاگ.

**شکمو** / šekamû ، ـها/: صفت. */گفتاری/* نەوسن؛ نۆسن؛ چلێس؛ چڵس؛ سکن؛ زکن؛ زکەڕۆ؛ زگەڕوو؛ گنۆیی؛ زگ‌لەوەڕێن؛ لەمن؛ کەلپاچا؛ کەلپاچە؛ لەموو؛ چڵەک ‹این بچه خیلی شکمو است: ئەم منداڵە زۆر نەوسنە›.

**شکمی**[1] / šekamî/: صفت. ۱. زگینە؛ زکی؛ پێوەندیدار بە سکەوە ۲. */مجازی/گفتاری/* حولحولی؛ هاکۆ؛ بەبێ بیرکردنەوە و ژیری ‹همه‌ی حرفهایش شکمی است: هەموو قسەکانی حولحولیە›.

**شکمی**[2]: قید. */گفتاری/* هاکۆ؛ حولحولی؛ بەبێ کەڵک وەرگرتن لە بیر و ژیری ‹این قدر شکمی حرف نزن!: هێندە هاکۆ قسە مەکە!›.

**شکن**[1] / šekan ، ـها/: اسم. ۱. کۆل؛ چین؛ توێ؛ گنج؛ لۆچ؛ چرچ؛ ئەو بەشە لە لۆچ کە ڕۆچووە ۲. چەماوەی کووڕ * **شکنج** */ادبی/*

**ــ شکن**[2]: پیواژە. ۱. ــ شکێن؛ ـ مار: بە

تایبەتمەندی یان توانایی شکاندنەوە ‹شیشەشکن: قندشکن؛ موجشکن: شووشەشکێن؛ قەنشکێن؛ شەپۆلشکێن› ۲. بە تایبەتمەندی شکیانەوە ‹دیرشکن: دێرشکێن›.

**شکنج** / šekanc ، ـها/: *اسم./ادبی/* ۱. ☜ **شکن**[1] ۲. */معماری/* گوارە؛ گۆشوارە؛ دەرپەڕیوی دیوار بە شێوەی ڕیزێ لە ئاجۆر، بەتایبەت لە شوێنی لکانی دیوار بە میچەوە یا دەورو بەری درگادا: **گوشواره**

**شکنجه** / šekance ، ـها/: *اسم.* ۱. شکەنجە؛ ئەشکەنجە؛ ئازار و جزیا؛ جەربەزە؛ جەزرەبە؛ تراز؛ جەڕ و مەنگەنە؛ کارەڕەهاتی ئازاردانی دژواری کەسێک (وەک لێدان ، سووتاندن یان شکاندنی ئەندامی لەش) کە بۆ تەمێ کردن یان سەپاندن، بە سەریدا دێنن.

▣ **شکنجه دیدن/ شدن:** ئەشکەنجە دیتن/ بوون؛ ئەشکەنجەکران/ کریەی؛ ئازار دیتن ‹در مدت بیماری خیلی شکنجه دید: لە ماوەی نەخۆشیەکەیدا زۆر ئەشکەنجەی بینی›.

**شکنجه کردن:** ئەشکەنجە دان؛ ئەشکەنجە کردن؛ ئازاردان ‹برای گرفتن اقرار او را ساعتها شکنجه کردند: بۆ قسە لێکێشانی، چەن سەعات ئەشکەنجەیان دا›.

**شکنجه‌گاه** / šekancegāh ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سزاخانە؛ جەزرەبەگە؛ شکەنجەگا؛ شوێنی جەزرەبەدان.

**شکنجه‌گر** / šekancegar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ئەشکەنجەدەر؛ ئازاردەر؛ کەسێ کە کاری ئەشکەنجەکردنی گرتووانە بە مەبەستی قسە لێکێشانەوە یان سەپاندنیان.

**شکنندگی** / šekanandegî/: *اسم.* توورتی؛ تووێری؛ شەقی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تورت بوون ‹برخی از استخوانهای بدن به خاطر شکنندگی با لایه‌ای از گوشت پوشیده شده است: بڕێک لە ئێسکەکانی لەش بە هۆی تورتیەوە بە چینێک لە گۆشت داپۆشراون›.

**شکننده** / šekanande/: *صفت.* ۱. بشکێن؛ بەشکان ۲. */مجازی/* تورت؛ تووێر؛ شەق؛ شلک ۳. شەق؛ فشەڵ؛ سست و خۆنەگر.

**شکوائیه** / šekvā'îyye ، ـها/: [عربی] *اسم.* سکالانامە؛ دادخواز.

**شکوفا** / šukûfā, šokûfā/: *صفت.* ۱. شکۆفا؛ شکۆفاوە؛ پشکووتوو؛ بشکفتی؛ قەبووی؛ بە پشکووت؛ بە شکۆفیانەوە ‹گل شکوفا: گوڵی شکوفا› ۲. */گیاه‌شناسی/* بە تایبەتمەندی بشکافتن دوای پێگەیین (وەکوو میوەی شەوبۆ و خاکشیر) ۳. */مجازی/* گەش؛ بەبرەو ‹اقتصاد شکوفا: ئابووری گەش›.

**شکوفائی** / šukûfā'î, šokûfā'î/ ☜ **شکوفایی**

**شکوفان** / šukûfān, šokûfān/: *صفت. /نامتداول/* پشکووتوو؛ شکۆفا؛ شکۆفاوە؛ بە پشکووت.

**شکوفاندن** / šukûfāndan, šokûfāndan/: *مصدر. متعدی.* // **شکوفاندی:** گەشاندتەوە؛ **می‌شکوفانی:** دەگەشێنیەوە؛ **بشکوفان:** بگەشێنەوە// گەشاندنەوە؛ شکۆفاندنەوە؛ پشکواندن؛ پشکووتاندن؛ پێهەڵدانەوە؛ پشکووژاندن؛ پژکاندنەوە؛ پژکووژاندن؛ پشکووژاندن؛ پشکاندن؛ خەنی کردن؛ خەڕۆ کردن؛ بوونە هۆی گەشانەوە یان هەڵدان.

■ صفت فاعلی: **شکوفاننده** (وەگەشێنەر)/ صفت مفعولی: **شکوفانده** (وەگەشێنراو)

**شکوفایی** / šuklûfāyî, šokûfāyî/: *اسم.* پشکووتوویی؛ شکۆفایی: ۱. کار یا ڕەوتی پشکووتن؛ شکۆفیانەوە؛ ئەوەتنگیەی؛ قۆناغی پشکووتن و گوڵ دان ‹فصل شکوفایی گل سرخ: وەرزی پشکووتنی گولەسوورە› ۲. */مجازی/* گەشە؛ ڕەوتی بەرەو پێش چوون و پێش کەوتن ‹شکوفایی اقتصادی: گەشەی ئابووری›.

**شکوفه** / šukûfe, šokûfe, šekûfe ، ـها/: *اسم.* شکۆفە؛ کولووک؛ کڵووک؛ گوولوک؛ گولیک:

١. گۆچک؛ خونچە؛ گۆپکە؛ گوڵدەم؛ پێژەک؛ ول؛ چەم؛ گوڵێ کە هێشتا نەپشکووتووە ‹شکوفەی نرگس: شکوفەی نێرگس› ٢. بشکوژ؛ پشکۆژ؛ پشکوژ؛ پژکووژ؛ بشکۆش؛ پشک؛ پژک؛ هەڕاڵە؛ فنچقە؛ باتینک؛ جۆش؛ گوڵی دار ‹شکوفەی سیب: شکوفەی سێو›.

▣ **شکوفه کردن:** ١. شکۆفیانەوە؛ شکۆفە کردن؛ فنچقەکردن؛ کولووک کردن؛ گوڵ کردن؛ گوڵدەم کردن؛ ئاخڤین؛ دیاری دانی چرۆ لە سەر بنچکەوە ‹درخت سیب شکوفه کرده است: داری سێو شکوفەی کردووە› ٢. */گفتاری/* ڕشانەوە؛ هەڵاوردنەوە؛ هەڵهاوردنەوە؛ زێڵەوە شیویەی ‹بچه شکوفه کرد روی لباسم: منداڵەکە ڕشایەوە سەر لیباسەکەمدا›.

**شکوک** / šukûk/: [عربی] جمعِ ☜ **شک**

**شکوه** / šekve ، ـهـا/: [عربی]*/اسم.* ١. گازندە؛ شکات؛ لاکایە؛ لاکایا؛ سکالا ‹از درد پا شکوه می‌کرد: لە ژانە پێ گازندەی دەکرد› ٢. گلەیی؛ گلەی؛ لەمەت ‹از بی‌وفایی دوستان شکوه می‌کرد: لە بێئەمەگی هەوالان گلەیی دەکرد›.

**شکوه** / šukûh, šokûh/: */اسم.* شکۆ؛ تەنتەنە؛ سەنسەنە؛ سەنتەنە؛ هنگوونگ؛ جەلال و شکۆ؛ جوانی و ڕازاوەیی بەرچاوگر کە بینەر دەخاتە ڕەوش و سەرسامیەوە ‹شکوه خیره‌کننده‌ی صبح بهاری: شکۆی دلڕفێنی بەرەبەیانی بەهاران›.

**شکیات** / šakkîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **شک**

**شکیب** / šakîb/: */اسم. /ادبی/* سەور؛ سەبر؛ ئارام؛ بەرداری؛ سەرەخۆیی؛ نەرمووی؛ هێمنی؛ قەری؛ ئۆقرە؛ پڕزوویی؛ تەوتین؛ تەوات؛ پشوودرێژی؛ بێنفرەهی؛ پڕزەداری؛ توانایی خۆڕاگری لە بەرانبەر سەختی و نالەباریەوە.

**شکیبا** / šakîbā/: *صفت. /ادبی/* هێمن؛ پشوولەسەرخۆ؛ پرزوو؛ بە برست؛ بێن‌فرەهـ؛ بە تابشت؛ بە تاقەت؛ بەحەوسەڵە؛ نەرموو؛ سەرەخۆ؛ لەسەرەخۆ؛ هێدی؛ جەرگ‌قایم؛ بەورە؛ دڵقایم؛ بەردار؛ دڵفراوان؛ خاوەن توانایی خۆڕاگرتن لەبەرانبەر چەوتی و چەڵەمەوە.

**شکیبائی** / šakîbā'î/ ☜ **شکیبایی**

**شکیبایی** / šakîbāyî ، ـهـا/: */اسم. /ادبی/* ١. پڕزوویی؛ تەوتین؛ تەوات؛ پشوودرێژی؛ بێنفرەهی؛ پڕزەداری؛ شێنەیی؛ کاوەخۆیی؛ سەمەتی؛ توانایی ڕاوەستان لە هەمبەر سەخڵەتی، دژواری یان دۆخێکی ناخۆشەوە ‹در برابر بدرفتاری مادرشوهرش شکیبایی می‌کرد: لە هەمبەر لاساری خەسوویەوە پڕزوویی دەکرد› ٢. پشوودرێژی؛ ئۆقرەیی؛ پشوولەسەرخۆیی؛ کار یان ڕەوتی شینەیی نواندن؛ بەر بە خۆگرتن تا هەلی ڕەخساو ‹تا آمدن برادرش شکیبایی کرد و هیچ نگفت: تا هاتنی براکەی شینەیی نواند و هیچی نەگوت› ❋ **شکیبائی**

**شکیبیدن** / šakîbîdan/: *مصدر. لازم. /ادبی/* // **شکیبیدی:** هەڵتکرد؛ **می‌شکیبی:** هەڵدەکەی؛ **بشکیب:** هەڵکە// هەڵکردن؛ دەربردن؛ هۆرکەردەی؛ ڕاوەستان لە هەمبەر دۆخ یان چۆنیەتیێکی ناخۆش و نالەبارەوە.

**شکیل** / šakîl/: [عربی] *صفت. /ادبی/* شەمەند؛ لەبار؛ پێکەوتوو؛ بە بیچمی جوان و لە بەرچاوەوە ‹یک مجسمه‌ی شکیل وسط میدان قرار داشت؛ خانه‌شان خیلی شکیل بود: پەیکەرێکی شەمەند لە ناوەندی گردەکە بوو؛ ماڵەکەیان زۆر لەبار بوو›.

**شگرد** / šegerd ، ـهـا/: */اسم. /گفتاری/* ڕێکار؛ شێوازی کار.

**شگرف** / šegarf/: *صفت. /ادبی/* ١. هەژەند؛ سەیر و سەمەرە؛ بە چەندێتی یان چۆنیەتی سەرسووڕێنەرەوە ٢. نایاب؛ کەموێنە.

**شگفت** / šegeft/: *صفت. /ادبی/* سەیر؛ سەمەرە؛ هەژەند؛ سەرسوڕێن؛ سەرسووڕێن؛ عەجایب؛ سۆبەت؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی سەرسووڕ هێنەریەوە.

▣ **شگفت آمدن:** */ادبی/* سەرسووڕمان؛ سەرسام

بوون؛ سەیرمان؛ واق‌ورمان؛ هیدمان؛ هۆت بوون؛ سەر ماسین؛ ڤەتەوشین؛ شکڤین؛ مەنەی؛ سەر سڕ مەنەی تووشی سەرسووڕمان بوون: **به شگفت آمدن**

**به شگفت آمدن** ☜ **شگفت آمدن**

**شگفت‌آور** / šegeftāver/ ☜ **شگفت‌انگیز**

**شگفت‌انگیز** / šegeftangîz/: صفت. سەرسووڕێن؛ سەرسووڕێنەر؛ سەرسام‌کەر؛ سەیر و سەمەرە؛ هەژێنەر؛ هۆی سەرسامی ‹رویداد شگفت‌انگیز: ڕووداوی سەرسووڕێنەر›: **شگفت‌آور**

**شگفت‌زدگی** / šegeftzadegî ، ـها/: اسم. سەرسووڕماوی؛ واق‌ورماوی؛ دۆخ یان چۆنیەتیەک کە بە هۆی ڕووبەڕوو بوون دەگەڵ دیاردە یان ڕووداوێکی نوێ و چاوەڕوان نەکراوەوە هەڵ ئەدا ‹همه از این شگفت‌زدگی او خندیدیم: هەموومان لەم سەرسووڕماویەی پێکەنین›.

**شگفت‌زده** / šegeftzade ، ـها؛ ـگان/: صفت. سەرسووڕماو؛ سەیرماو؛ واق‌ورماو؛ سەرمەند؛ تووشی واق‌وڕماوی بووگ ‹از دیدن تصویر خود در کنار آن هنرپیشه خارجی شگفت‌زده شد: لە دیتنی وێنەی خۆی لە تەنیشت ئەو ئەکتەرە بیانیەوە سەری سوورما›. هەروەها: **شگفت‌زده شدن؛ شگفت‌زده کردن**

**شگفتی** / šegeftî ، ـها/: اسم. سەرسووڕماوی؛ واق‌ورماوی؛ هەژەندی؛ پەرچەکرداری زەینی یان عاتیفی کە بەهۆی ڕووداوێکی ڕەچاو نەکراو یا دیاردەیەکی تازە، لە مرۆدا پەیدا دەبێ ‹شگفتی او از آن بود که هرگز آن هنرپیشه را از نزدیک ندیده بود: سەرسووڕماویەکەی لەوەدا بوو کە ئەو هونەرپیشەیەی قەت لە نزیکەوە نەدیبوو›.

**شگون** / šugûn, šogûn/: اسم. [گفتاری] ودم؛ هورم؛ یومن؛ پیرۆزی؛ ممبارەکی؛ مبارەکی؛ ماراو؛ هات؛ بەخت؛ دیاردە یان ڕووداوێ کە بە هۆکاری ڕووداوێک لە داهاتوودا بزانرێ، بەتایبەت ئەوەی بە هۆی ڕووداوێکی چاک دابنرێ ‹نگاه کردن به سبزه و آب روان شگون دارد: ڕامێنان بۆ شینایی و ئاوی ڕەوان ودمی هەیە›.

▣ **شگون داشتن:** بەودم بوون؛ نیشانە یان هۆی ڕووداوێکی چاک و باش بوون. هەروەها: **شگون نداشتن**

**شل**¹ / šal ، ـها/: [عربی] اسم. شەل؛ شەلە؛ نجمی؛ چووز؛ لەنگ؛ لنگ؛ سەقەت؛ کڕ؛ مقرۆ؛ کەسێ کە دەست یان (بەتایبەت) پای لە کارکەوتووە.

**شل**²: صفت. شەل؛ لەنگ؛ لنگ؛ چووز؛ نجمی؛ کڕ؛ کوولەک؛ قلۆپ؛ خاوەن دەست یان پێی گەزنگاز یان لەکارتە ‹با ماشین تصادف کرد و یک پایش شل شد: ماشێن لێی دا و پایەکی شەل بوو›.

**شل**¹ / šol/: صفت. شل: ١. فش؛ فل؛ پلت؛ بل؛ ول؛ ڕاو؛ بەبێ پەیوەند یان پێکەوەلکاوی پێویست دە نێوان پاژگەلدا ‹خمیر شل؛ ملاط شل: هەویری شل؛ مەلاتی شل› ٢. خۆنەگر؛ شل و ول؛ شست؛ سست؛ شل و شەویق؛ شلویق؛ ناپتەو ‹گره شل؛ پیچ شل: گرێی شل؛ پێچی شل› ٣. /ـها/ [مجازی] خاو؛ خلیسک؛ بەبێ چڕ و پڕی پێویست ‹آدم شل: مرۆی شل›.

▣ **شل آمدن:** [مجازی] شل گرتن: ١. سەخت نەگرتن ٢. پایەی نەبوون؛ داکۆکی نەکردن؛ پەیجۆر نەبوون؛ بە دوادا نەچوون؛ لە سەر نەچوون؛ پێداگری نەکردن (لە جێبەجێ‌کردنی ویست یان کاردا).

**شل بودن:** شل بوون؛ شەویق بوون: ١. سست بوون ٢. نەرم بوون. هەروەها: **شل شدن؛ شل کردن**

**شل گرفتن:** [مجازی] شل گرتن: ١. پێ دانەگرتن ٢. بێ‌مەیلی کردن؛ بێ‌مەیلی نیشان‌دان (لە جێبەجێ‌کردنی ویست یان کارێکدا).

**شل**²: قید. شل: ١. خاو؛ بە سستی؛ بە شەویقی؛ بەبێ هێز و هەوڵی پێویستەوە ‹خیلی شل حرف می‌زد: زۆر قسەی شل بوو› ٢. شل‌وول؛ نەبەگە

‹شل بستن: شل بەستن› ❋ بەرانبەر: **قرص**

**شـل** / šel/: [سنسکریت]/اسم./قدیمی/ زەرگ؛ هوویزی؛ ڕمبی کورت؛ نەیزەی کورتی شەڕ.

**شلاب** / šolāb/: /اسم. ١. چلپاو؛ شلپاو؛ لیتاو؛ زلقاو؛ هەڕاوە؛ قوڕاوی زۆر شل ‹همین‌طور که قدم برمی‌داشتم، شلاب می‌پاشید به پاچه‌های شلوارم: هەر وا کە هەنگاوم دەنا، چلپاو دەپژایە دەرپێی پاتۆڵەکەمدا› ٢. بەفراو؛ وەرواوە؛ شلۆپە؛ ئاوێ کە بە هۆی هەلیان یان بارینی بەفرەوە بەدی دێ.

**شلاق** / šallāq/: [ترکی]/اسم. شەلاخ؛ شەلاق؛ تازیانە؛ قامچی؛ شێلاق؛ تاژان؛ تاژانک؛ تۆرە ‹بە ٥٠ ضربه شلاق محکوم شد: ٥٠ زەربەت شەلاخی بۆ براوە›.

▣ **شلاق زدن**: شەلاخ لێدان؛ شەلاخکاری کردن؛ بە قامچی لێدان ‹او را ٧٤ ضربه شلاق زدند: ٧٤ زەربە شەلاخیان لیدا›.

**شلاق کشیدن**: قامچی‌کێشان؛ شەلاخ بۆ بەرزکردنەوە/ وەشاندن ‹شلاقش را کشید که بزند، دستش را گرفتم: قامچیەکەی کێشا دایوەشێنێ، دەستیم گرت›.

**شلاق‌کش** / šallāqkeš/: [ترکی/ فارسی] قید. /مجازی/ بە هەڵەداوان؛ تێزە- تێزە؛ لەزای‌لەز؛ بریو- بریو؛ بەگورجی؛ گورجی؛ خێرا؛ بە توند و تیژی؛ بە پەلە؛ بەلەز؛ گورج و گۆڵ ‹شلاق‌کش خودمان را رساندیم به شهر: بە هەڵەداوان خۆمان گەیاندە شار›.

**شلاقی** [1] / šallāqî/: [ترکی] صفت. شەلاخی؛ شەلاقی؛ لە بیچمی شەلاق ‹کرم شلاقی: کرمی شەلاخی›.

**شلاقی** [2]: قید. /گفتاری/ بە پەلە؛ بەلەز؛ خێرا؛ پەلەپەل؛ گورج؛ کرژ و کۆڵ؛ گورج و گۆڵ.

**شـلاک** / šelāk/: /اسم. [انگلیسی] لۆک؛ دەمەلۆک؛ جۆرە زەمقێکی سووری سروشتیە لە توێکلی لق و قەدی هەندێ درەختی ناوچە گەرمەکاندا دەردێ، تەزبیحی لێ دروست دەکرێ و بۆ چێ کردنی ڕەنگیش بەکاردێ.

**شلال** / šolāl, šelāl ، ـها/: /اسم. شەلال؛ شەلاڵ؛ شلاڵ؛ جۆرێ درووماندە کە دەزوو لە هەر دوو دیوی پارچەکەوە دەردێ. هەروەها: **شلال‌دوزی**

**شلان- شلان** / šalānšalān/: [عربی/ فارسی/ عربی/ فارسی] قید. /گفتاری/ شەلە شەل؛ شەلان-شەلان؛ لەنگە لەنگ ‹شلان-شلان خودم را رساندم به درمانگاه: شەلە شەل خۆم گەیاندە دەرمانگە›.

**شل‌بافت** / šolbāft/: صفت. تەنک؛ بە چنێکی شل و تان و پۆی لێک‌دوورەوە.

**شـلپ** / šelep/: صوت. /گفتاری/ شلپە؛ شلپ؛ شلاپ؛ شلەپ؛ شەپ؛ چلپە؛ دەنگی کەوتنە ناو ئاوەوەی شتێ ‹شلپ افتادنش در آب را شنیدم: شلپەی داکەوتنە ناو ئاوەکەیم بیست›.

▣ **شلپ- شلپ بوسیدن**: شلپەشلپ ماچ‌کردنەوە؛ ملچەملچ ماچ‌کردن؛ ملچی-ملچی ڕاموسین؛ شلپ- شلپ ڕاموسین؛ بە شلپەوە ماچی یەک لە دووی کردن.

**شلپ- شلپ کردن** ☜ شلپ‌شلوپ کردن، **شلپ شلوپ**

**شـلپ شـلوپ** / šelepšulûp/: صوت. /گفتاری/ شلپەشلپ؛ شەپەشەپ؛ دەنگی ویک‌کەوتنەوەی شتێک (وەک لەپی دەست) بە سەر شتێکی نەرمدا (وەکوو ئاو) ‹بچه‌ها توی آب چه شلپ‌شلوپی راه انداخته‌اند: منداڵەکان لە نێو ئاوەکەدا چ شلپەشلپێکیان ڕێخستووە›: **شالاب‌شلوپ**

▣ **شـلپ شـلوپ کـردن**: شلپەشلپ کردن؛ دەرهێنانی دەنگی شلپەشلپ: **شلپ-شلپ کردن**

**شلتاق** / šeltāq ، ـها/: [ترکی]/اسم. دەبە؛ دەبیە؛ دەوە؛ تەشخەڵە؛ تەشقەڵە؛ گەڕ؛ شلتاخ؛ قەرقەش؛ چاچۆلە؛ گغنی؛ چوور؛ گۆتاڵ؛ گیتەڵ؛ گێچەڵ؛ حەچەل؛ پەلپ؛ گزی؛ گرنی؛ کار یان ئاکارێک (وەک پەلپ، گێچەڵ و گرم و قاڵ) بۆ تەنگەتاو کردنی مافی ئەوانی‌تر، یان لە ژێر کار

دەرچوون ‹هر وقت نوبت کار کردنش بود شلتاق می‌کرد و از زیر کار درمی‌رفت: هەر کات نۆبەی کارکردنی بوو دەبەی دەکرد و لە ژێر کار دەردەچوو›.

**شلتاق‌باز** / šeltāqbāz ، ـها؛ ـان/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* گرنی؛ تەشقەڵەباز؛ گرنی‌واز؛ فێڵەباز؛ گزەوەن؛ گزیکەر.

**شلتوک** / šaltûk ، ـها/: *اسم.* چەڵتووک؛ شەڵتووک؛ چەڵتک؛ شەبلووک؛ چڵتووک؛ برنجێ کە هێشتا لە تێکوڵ دەرنەهاتووە: **چلتوک**

**شلختگی** / šalaxtegî ، ـها/: *اسم.* شپرزی؛ شپرزەیی؛ شەپرزەیی؛ شەپرێوی؛ شپرێوی؛ شپلۆخی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شپرز بوون ‹شلختگی از سر و ریختش می‌بارید: لە سەر و سەرکوتی شپرزی دەباری›.

**شلخته** / šalaxte ، ـها/: *صفت.* شپرز؛ شپرزە؛ شەپرزە؛ شەپرێو؛ شپرێو؛ شپلۆخ؛ بەبێ تەکووزی لە کاردا ‹این عروس شلخته‌ی من سال تا سال خانه‌اش را گردگیری نمی‌کند: ئەم بووکە شپرزەی من ساڵ بۆ ساڵیش ماڵەکەی خاوێن ناکاتەوە›.

**شل‌شلکی** / šolšolakî/: *قید.* شل‌وول؛ شل‌وشەوێق؛ بە شل‌وولی؛ بە شل‌وشەوێقی؛ نەبەگەیی ‹این طور شل‌شلکی نگیر، از دست می‌افتد: بەم جۆرە شل‌وول مەیگرە، لە دەستت دادەکەوێ›.

**شلغم** / šalqam ، ـها/: *اسم.* شەڵغەم؛ شەلەم؛ شەلەمێ؛ شێلەم؛ شێلم؛ شەلم؛ شێمی؛ ترپۆکە؛ تیتوو؛ تینۆک: ۱. گیایێ ئالیکی یەک یان دووساڵانە لە تیرەی سلق و چۆنەر کە وەک سەوزی دەچێندرێ ۲. بنی گیای شەلەم کە ئەستوور و گۆشتنە، چێژەیێکی توندی هەیە و دەخورێ.

**شلکا** / šelkā/: *اسم.* لیتە؛ زڵقاوی بنی ئۆقیانووس.

**شل کن- سفت کن** / šolkonsef(t)kon ، ـها/: *اسم. /مجازی، گفتاری/* بگرەوبەردە؛ ئەمدەس و ئەودەس؛ ئەم پا و ئەو پا؛ ئاکاری شێوانشێو، پێچاوپێچ و بێ‌ئاکام بۆ جێبەجێ‌کردنی کارێک ‹در مورد مسکن آن‌قدر شل کن- سفت کن درآوردند که این‌طور شد: لەمەڕ خانووبەرەوە هێندە بگرەوبەردەیان کرد تا ئاوای لێهات›.

**شلم‌شوربا** / šalamšûrbā/: *صفت. /مجازی، گفتاری/* هەرەمەگۆڵخار؛ تێکەڵ-پێکەڵ؛ شپرز و شێواو ‹کتابخانه یک وضع شلم‌شوربایی پیدا کرده که نگو!: کتێبخانەکە بۆتە هەرەمەگۆلخارێ مەپرسە!›.

**شلمک** / šalmak/: *اسم. /گیاه‌شناسی/* زیزانە؛ چەودەر؛ گیاداسی؛ بیلیلک؛ ئومەسلا؛ زیوان؛ شێلمۆگ؛ گیاڕووتە؛ گیاشێلە؛ کاڵتاس؛ گیابریش؛ مرۆر؛ ولیزە؛ خولێرە؛ خلێرە؛ دەغەڵ؛ شەلەمە؛ دنێب؛ گیایێکە لە ناو دەغڵ و داندا دەڕوێت، بەرەکەی لە گەنم بچووکترە، دەنکەکەی تاڵ و ژەهریە و بۆ دەغڵ و دان زیان دەرە.

**شلنگ** / šelang/: [از آلمانی/ ؟] ☜ **شیلنگ**

**شلنگ‌تخته** / šelangtaxte/: *اسم. /گفتاری/* هەڵپەڕ- داپەڕ؛ فرت‌وهۆڕ؛ هەڵبەز- دابەز؛ جرت‌وفرت.

▣ **شلنگ تخته انداختن**: هەڵتیزان: ۱. */گفتاری/* جرت‌وفرت کردن؛ بە هەنگاوگەلی بەرز و نارێکەوە ڕێگە چوون ۲. */تعریض/* هەڵپەڕ-داپەڕ کردن؛ فرت‌وهۆڕکردن؛ هەڵبەز- دابەزکردن ‹به اسم رقص داشتند شلنگ‌تخته می‌انداختند: به ناو هەڵپەڕکێوە خەریکی هەڵتیزان بوون›.

**شلوار** / šalvār ، ـها/: *اسم.* شوال؛ شەروال؛ شەوال؛ شاروال؛ شالوار؛ شەلوار؛ پانتۆل؛ پاتۆل؛ پانترۆل؛ پاتۆلێ؛ پاپۆش؛ پۆشەنێ بۆ پشتێنە بەرەو خوار، بە دوولنگەوە کە هەر لنگێکی پایەک تا قولەپێ دادەپۆشێ.

▣ **شلوار کوتاه**: شەروالی کورت؛ پانتۆلێ کە تا نێزیک ئەژنۆ دادەپۆشێ.

**شلوارجورابی** / šalvārcûrābî، ـها/: *اسم.* جۆرێک شەرواڵی منداڵی ساوایە کە گۆرەوییەکی هەر لەو جنسەی پێوە دووراوە.

**شلوارک** / šalvārak، ـها/: *اسم.* کوڵەشواڵ؛ جۆرێک شەرواڵ(زۆرتریش ژنانە) کە تەنیا تا ژووری ئەژنۆ دادەپۆشێ.

**شل‌وپل** / šal-o-pal/: [عربی از کردی] *صفت. [گفتاری]* شەل‌وپەت؛ شەل‌وکوت؛ شەل‌وپەل ‹زد بچەی مردم را شل‌وپل کرد: دای لە منداڵی خەڵکی شەل‌وپەتی کرد›.

**شلوغ** / šulûq, šolûq/: [ترکی] *صفت.* ژلوق؛ شلۆق؛ شلووق؛ شلووغ؛ شلۆغ: ۱. شپرز؛ شەپرز؛ شپرێو؛ شەپرێو؛ داچنیاگ؛ پژگیا؛ تێکەڵ‌ـپێکەڵ ‹روی میز خیلی شلوغ است: بان مێزەکە زۆر شپرزە› ۲. جەنجاڵ؛ گەوز؛ گورمۆرە؛ گوردەم؛ گژـگژ؛ هەیشەت؛ گورتل؛ کۆمرە؛ قەرەباڵغ؛ پرحەشامەت ‹پیادەروها بس کە شلوغ بود، نمی‌شد راه رفت: پیادەڕەوەکان ئەوندە جەنجال بوون هات‌وچوو نەدەکرا› ۳. چرەبەندان؛ کەڵەکە؛ کەڵەکەبڕین؛ جەنجاڵ؛ ژلیواو؛ بشێوە؛ گاشە؛ گەوز؛ گورمۆرە؛ گوردەم؛ گژـگژ؛ هەیشەت؛ گورتل؛ جێی مەترسی؛ ناهێمن (بە بۆنەی شەڕ، ڕاپەڕین و شتی واوە) ‹یک دفعه شهر شلوغ شد و همه ریختند توی خیابانها: بە جارێ شار بوو بە چرەبەندان و هەمووان ڕژانە سەر شەقامەکانەوە› ٤. /ـها/ هار و هاج؛ دەزبزێو؛ نائارام؛ دەست‌بزێو ‹بچەی شلوغ: منداڵی هاروهاج›.

▣ **شلوغ شدن:** شڵەژان؛ تێکچوون؛ شلۆق بوون؛ ژلیویان؛ بوونە ئاخۆران‌ـ باخۆران؛ بوونە ئاژاوە؛ پێکهاتنی بێ‌سەرە و بەرەیی.

**شلوغ کردن:** ۱. زەنا‌ـ زەنا کردن؛ زڵە کردن؛ چەقە و گورەکردن؛ هار و هاجی کردن؛ زرێ ئامایش؛ زرایش ۲. ئاپۆرە دان؛ کۆمرەدان؛ گورمۆرەکردن.

**شلوغ‌پلوغ** / šulûqpulûq, šolûqpolûq/: [ترکی/ فارسی] *صفت. [گفتاری]* تێکەڵ‌پێکەڵ؛ ژلووق؛ بێ‌سەرەوبەرە؛ کەس لە کەس؛ شێواو ‹با شروع بمبارانها همه جا شلوغ‌پلوغ شده بود: لەگەڵ دەسپێکردنی بوردومانەکان هەموو شوێنێ تێکەڵ‌پێکەڵ ببوو›.

**شلوغ‌کاری** / šulûqkārî, šolûq-/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* ۱. هەراوهوریا؛ کار یا ڕەوتی دەنگ و دور و قرم و قاڵ پێکهێنان ‹می‌خواست با شلوغ‌کاری کارش را پیش ببرد: دەیەویست بە هەراوهوریا کارەکەی بەرێتە پێشەوە› ۲. بشێوەکاری؛ گاشەکاری؛ کار یا ڕەوتی پێکهێنانی ئاژاوە و بێ‌سەر و بەرەیی ‹در موقع بازرسی با یک شلوغ‌کاریهایی مواجه شدیم: لە کاتی سەرکێشیدا بشێوەکاریگەلێکمان هاتە بەر چاو›.

**شلوغ‌کن** / šulûqkon, šolûq-/: [ترکی/ فارسی] *صفت. [گفتاری]* هەراکەر؛ چەقەکەر؛ خاوەن خوو یا مەیلەو شلۆقی کردن.

**شلوغی** / šulûqî, šolûqî/: [ترکی] *اسم.* چرەبەندان؛ هەیشەت؛ حەلەلا؛ حەشر و حەلەلا؛ ژلوقی؛ شلۆقی؛ کەڵەکە؛ بۆش؛ گوردەم؛ ئاپۆرە؛ گورمۆرە؛ گورتل؛ کۆمرە؛ جمکوت؛ زڵە؛ حەشرە؛ حەشەرەلا؛ حەشر؛ گژـگژ؛ قەرەباڵغ؛ هەرا و زەنا؛ چەقە و گورە؛ گانەگۆڵ؛ دۆخ یان چۆنیەتی شلووق بوون (بە هۆی حەشامات، هەرا و زەنا و...) ‹توی آن شلوغی آدمها همدیگر را گم می‌کردند: لە نێو ئەو چرەبەندانەدا خەڵک یەکیان ون دەکرد›.

**شل و ول**[1] / šol-o-vel/: *صفت. [گفتاری]* شل و شەوێق؛ شل و ول: ۱. پەلشقە؛ ناقایم؛ شل؛ سست ‹گره شل و ول: گرێی شل و شەوێق› ۲. فشەڵۆک؛ خاو و خلیسک؛ خلیچک؛ شلوێق؛ خاو ‹آدم شل و ول: مرۆی خاو و خلیسک›.

**شل و ول**[2]: *قید.* شل‌وشەوێق؛ شل و ول: ۱. فشەڵۆک؛ شلوێق؛ دۆخ یان چۆنیەتی سست و لێک‌پساو بوون ‹چرا این بقچه را این‌قدر شل و ول بستەای؟: بۆچی ئەم بوخچەیەت ئەوندە شل‌وشەوێق

بەستۆتەوە؟〉 ٢. فش؛ ناپتەو؛ نەبەگە؛ بەبێ ڕێکوپێکی و پتەویەوە 〈خیلی شل و ول حرف می‌زد: زۆر شل و ول قسەی دەکرد〉.

**شله** / šole ، ـها/:/اسم. شلە؛ هەر یەکە لەو چێشتانە کە برنج و دانەوێڵە لەگەڵ ڕۆن و خوێ و بەهارات (جار و باریش گۆشت) ئاوێتە دەکەن و هێندە دەیکوڵێنن هەتا ڕەنگ بداتەوە.

**شله‌بریانی** / šoleberyānî/:/اسم. شۆروا؛ شۆرباو؛ شۆربا؛ چێشتێکە کە لە گۆشت، نۆک، برنج، پیواز، زیرە و ڕۆن دروست دەبێ.

**شله‌زرد** / šolezard ، ـها/:/اسم. شلەزەرد؛ چێشتێکە بە برنج و شەکر و زافەران لێ دەنرێ.

**شله‌قلمکار** / šoleqalamkār/: [فارسی/ عربی/ فارسی] ☜ آش شله‌قلمکار، **آش**

**شلی** / šalî/: [عربی]/اسم. شەلی؛ لەنگی؛ لنگی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لەنگ بوون؛ کار نەکردنی دەست و پا.

**شلی**[1] / šolî/:/اسم. شلی؛ کۆمتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شل بوون.

**شلی**[2]: صفت. [مجازی، گفتاری] ١. خاو؛ سست؛ بێحاڵ ٢. لێنەهاتوو؛ نەبەگە؛ فش؛ فشەڵۆک؛ خوتەل؛ خوێریلە؛ تەوەزەل.

**شلیاق** / šalyāq/: [عربی] ☜ **سنگ‌پشت ـ ٢**

**شلیته** / šalîte ، ـها/:/اسم. [قدیمی] شەلیتە؛ شەتە؛ جۆرێک دامەنی کوڵ، دەلْپ و لۆچـلۆچە کە ژنان بە سەر دەرپێوە لە پێی دەکەن.

**شلیدن** / šalîdan/: [عربی/ فارسی] مصدر. لازم. [گفتاری] // **شلیدی:** شەلیت؛ **می شلی:** دەشەلی؛ **بشل:** بشەلە// شەلین؛ شەلان؛ شەلیان؛ لەنگین؛ کوولین؛ نەجمین؛ شەلەی؛ شەلای؛ شەلەشەل چوونە ڕێگاوە 〈چرا می‌شلی؟: بۆچی دەشەلیی؟〉.

**شلیک** / šellîk/:/اسم. ١. تەقە؛ کار یان ڕەوتی تەقاندن؛ هاویشتنی گوللە لە چەکی گەرمەوە 〈شلیک کردن توپ: تەقاندنی تۆپ〉 ٢. شریخە؛ دەنگێک وەکوو ئەو تەقە 〈شلیک خنده: شریخەی پێکەنین〉. هەروەها: **شلیک شدن؛ شلیک کردن**

**شلیل** / šalîl ، ـها/:/اسم. شەلیل؛ شلۆر؛ حەمەشین؛ هەڵووچەقەیسی؛ حەمەدەشین؛ تەڕازەن؛ تەرەزەن: ١. دارێک لە تیرە و جۆرەکانی قۆخ و هەشتاڵوو ٢. بەری ئەو دارە کە لووس، بێتووک و سپی یان زەرد و سوورە.

**شم** / šam(m) ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. هەستی بۆنی ٢. [مجازی] تێگەیشتوویی؛ کارامەیی؛ سەردەرچوویی 〈شم سیاسی: تێگەیشتوویی ڕامیاری〉.

**شما** / šemā/: [فرانسوی]/اسم. شیما؛ مەلەزە؛ گەلالە؛ گلالە؛ گەلالە؛ وێنەیەکی بێ وردەکاری و تەنیا بە چەند هێڵ کە بابەتەکە بگەیێنێ.

**شما** / šomā ، ـها؛ یان/: ضمیر. ئێوە؛ ئەنگۆ؛ شمە؛ هەوە؛ هەڤە؛ وە؛ هوین؛ هووین؛ هنگ؛ هوون؛ هوونگ؛ هۆنگۆ؛ هۆن؛ هەنگۆ؛ ڤە؛ هون؛ هن: ١. جێناوی دووهەم کەسی کۆ ٢. جێناوی ڕێزدارانە بۆ دووهەم کەسی تاک.

**شمائل** / šamā'el/: [عربی] ☜ **شمایل**

**شماتت** / šemātat, šamātat ، ـها/: [عربی]/اسم. سەرکۆنە؛ لۆمە؛ لۆم؛ سەرکۆ؛ تەونج؛ دەمکوت؛ پلار؛ ولە. هەروەها: **شماتت شدن؛ شماتت شنیدن؛ شماتت کردن**

**شماتت‌آلود** / šemātatālûd, šamātat-/: [عربی/ فارسی] صفت. بە لۆمە؛ سەرکۆنانە؛ پلارانە؛ سەرکۆنەیانە؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی لۆمەگەرانەوە 〈نگاه شماتت‌آلود: ڕوانینی بە لومە〉. هەروەها: **شماتت‌آمیز**

**شمار**[1] / šomār, šemār/:/اسم. [ادبی] هەژمار؛ هژمار؛ ئەژمار؛ ژمار؛ شمار: ١. حیساب 〈به شمار آمدن: بە هەژمار هاتن〉 ٢. شۆ؛ ئەندازە؛ ڕادە؛ گۆرەبا 〈بی‌شمار: بێهەژمار〉 ٣. هەژمارە؛ ئەژمارە؛ ژمارە؛ شمارە 〈شمار دشمن: هەژماری دوژمن〉.

▣ **از شمار:** [ادبی] لە ڕیزی؛ لە ژمارەی 〈از شمار بهایم: لە ڕیزی چوارپێیان〉.

**در شمار**: *[ادبی]* له تاقمی؛ له ریزی؛ پێڕۆ ‹در شمار نیکان: له ریزی چاکان›.

▣ **به شمار آمدن**: هاتنه هه‌ژمار؛ به ئه‌ژمار هاتن؛ هاتنه حیساب؛ حه‌ساو بوون ‹او از مردان نادر به شمار می‌آمد: ئه‌و له پیاوانی بژارده ده‌هاته هه‌ژمار›. هه‌روه‌ها: **به شمار رفتن**

**به شمار آوردن**: هێنانه ئه‌ژمار؛ هێنانه حه‌ساب؛ حه‌ساو کردن؛ له ریزی کۆمه‌ڵێکدا هێنانه ئه‌ژمار ‹او را مردی کارآمد به شمار می‌آوردند: ئه‌ویان به پیاوێکی کارامه ده‌هێنایه ئه‌ژمار›.

**ـ شمار**[۲]: *پیوازه.* ـ ژمێر؛ ـ هه‌ژمێر؛ ـ هژمار؛ ـ ژمار؛ بژمێر ‹روزشمار؛ ساعت‌شمار: ڕۆژژمێر؛ کاتژمێر›.

**شمارش** / šomāreš, šemārš ، ـها/:*اسم.* کار و ڕه‌وتی ژماردن؛ هه‌ژمارتن؛ ئه‌ژماردن؛ ئه‌ژماره‌ی ‹در هنگام شمارش دقت کنید: له کاتی ژماردندا ورد بن›.

**شمارشگر** / šomārešgar, šemār- ، ـها/:*اسم.* ژمێرکار؛ ئه‌ژمارکار: ۱. پێژمێر؛ ماشینی ژماردن یان حه‌ساوکردن ۲. ـها/ ژماریار؛ هوومارتۆخ؛ که‌سێ که ده‌ژمێرێ.

**شمارک** / šomārak/:*اسم.* بارۆم؛ پێومانی وانه، نرخ، مز و...

**شمارگان** / šomārgān/:*اسم.* ژماره؛ ژمار؛ هه‌ژمار؛ ئه‌ژمار؛ تیراژ؛ ژماری چاپکراوی ده‌قێکی چاپی (وه‌کوو کتێب، ڕۆژنامه و...) ‹با وجود افزایش شدید جمعیت، افزایش شمارگان کتاب بسیار کُند و ناچشمگیر است: ئه‌گه‌رچی ژماری ئاپۆره به‌توندی هه‌ڵده‌کشێ، هه‌ڵکشانی هه‌ژماری کتێب زۆر که‌م و لاوازه›.

**شمارگر** / šomārgar ، ـها/:*اسم.* ژمێرۆک؛ ژمارۆک؛ کونتور؛ ئامرازی ژماردن و تۆمار کردن، وه‌کوو ژماردنی ماوه و هێزی کاره‌با و ئاوی له‌کارکراو و...

**شماره** / šomāre, šemāre ، ـها/:*اسم.* شماره؛ ژماره؛ ئه‌ژمار؛ هه‌ژمار؛ بژار؛ بژاره: ۱. ڕه‌قه‌مێک که نیشانه‌ی ناسیاوی یان جێگه‌ی که‌سێ یان شتێک له کۆمه‌ڵێکدایه ‹شماره‌ی صندلی؛ شماره‌ی شناسنامه: ژماره‌ی سه‌نده‌ڵی؛ ژماره‌ی پێناسه› ۲. په‌ڕه یان کاغه‌زێ که ژماره‌ی له سه‌ر نووسراوه ۳. ئه‌ندازه؛ ئه‌نازه؛ شۆ؛ گۆره‌با؛ ژماره‌یه‌ک که پێشانده‌ری ئه‌نازی شتێکه ‹شماره‌ی پایتان چند است؟: ژماره‌ی پاتان چه‌نده؟›.

▣ **شماره انداختن**: ژماره داخستن؛ شماره‌ره وسه‌ی: ۱. پیشاندانی چه‌نیه‌تیه‌کی گۆڕدراو به شێوه‌یه‌کی خۆمه‌ش ‹اگر آب مصرف شود کنتور شماره می‌اندازد: ئه‌گه‌ر ئاو بڕوا کونتور ژماره داده‌خا› ۲. نیشاندانی ژماره ته‌له‌فوون.

**شماره برداشتن**: ژماره هه‌ڵگرتن؛ ژماره نووسین؛ نووسینی ژماره‌ی شتێک ‹راننده پس از تصادف فرار کرد ولی شاهدان شماره‌ی ماشین را برداشتند: ڕانه‌نده پاش ته‌سادفه‌که ده‌رچوو به‌ڵام شایه‌ته‌کان ژماره‌ی ماشینه‌که‌یان هه‌ڵگرت›.

**شماره زدن**: ژماره لێدان؛ نووسین یان لکاندنی ژماره به سه‌ر شتێکه‌وه ‹ورقه‌ها را شماره بزن!: وه‌ره‌قه‌کان ژماره لێده!›.

**شماره کردن**: ژماره‌کردن؛ ژماره دانان به سه‌ر شتێکدا ‹ماشین را شماره کردم: ماشینه‌که‌م ژماره‌کرد›.

**شماره گرفتن**: ژماره وه‌رگرتن؛ ژماره‌گرتن؛ شماره‌گیرته‌ی: ۱. ژماره به ده‌ست هێنان ‹از منشی دکتر شماره گرفتم و نشستم توی نوبت: له نویسیاری دوکتور ژماره‌م وه‌رگرت و له نۆره‌دا دانیشتم› ۲. خولدان یان گوشار دانی ژماره‌گه‌لی دیاریکراو له سه‌ر ده‌زگای ته‌له‌فوون، بۆ پێوه‌ندی گرتن.

**شماره‌زن** / šomārezan ، ـها/:*اسم.* ژماره‌کوت؛ شماره‌کوت؛ ده‌زگایێ که به گوشاردانی لۆسه‌یه‌ک ژماره‌ی دڵخواز یان ژماره‌گه‌لی له

شوێن یەک چاپ دەکا.

**شـــماره‌زنـــی** / šomārezanî، ـهـا/:/اسـم. ژمـارەکوتی؛ شمـارەکوتی؛ کـار یـان ڕەوتی نووسین، چاپ‌کردن یان نەخشاندنی ژمارە.

**شـــماره‌گـــذاری** / šomāregozārî/:/اسـم. ژمارەدانەری: ١. /ـها/ کـار یـان ڕەوتی دیـاری کردن یان نووسینی ژمارەی شتێک ٢. بەشێک لە مەزرینگـەی ڕێنـوێنی و ئاژوانیـە کـە کـاری دیاری‌کردنی ژمارەی ئامێرگەلی گواستنیە.

**شماره‌گیـر** / šomāregîr، ـها/:/اسم. ژمـارەگر؛ ژمارەگیر؛ بەشـێک لـە دەزگـای تەلـەفوون بـە ژمارەگـەلی ٠ تـا ٩وە کـە بـەوانـەوە ژمـارەی ڕەچاوکراو دەگیردرێ و پێوەندی دادەمەزرێ.

**شـــماره‌گیـــری** / šomāregîrî، ـهـا/:/اسـم. ژمارەگری؛ ژمارەگیری؛ کار یان ڕەوتی خولاندن یان گوشاردانی ژمارەکانی ژمارەگیر بۆ پێوەندی تەلەفوونی ‹نیم‌ساعت است دارم شماره‌گیری می‌کنم، خط راه نمی‌دهد: نیوساعەتە خـەریکی ژمارەگیریـم، بەڵام ڕێ نادا›.

**ـ شماری** / šomārî, šemārî/: پیواژه. ـ ژمێـری؛ ـ ژماری؛ ـ هـەژمێری؛ ـ ئـەژماری ‹روزشماری؛ ثانیه‌شماری: ڕۆژژمێری؛ چرکەژمێری›.

**شـــماس** / šammās، ـهـا؛ ـان/: [عبـری]/اسـم. جانکوش؛ مجێوری کلیسا؛ خزمەتکاری کلیـسا: **خادم کلیسا**

**شماطه** / šammāte، ـها/: [روسی]/اسم. چەکوشە؛ زیل؛ زەنگی کاتژمێر.

**شماطه‌دار** / šammātedār/: [روسی/ فارسی] ☜ ساعت شماطه‌دار، **ساعت**

**شمال** / šomāl, šemāl/: [عربی]/اسم. ١. بـاکوور؛ یەکێ لە چوار لا سەرەکیەکان. بەرانبەر: **جنـوب** ٢. لای چـەپی کەسـێ کـە بـەرەو ڕۆژهەڵات وێستاوە ٣. مەڵبەندگەلی بـاکووری ٤. *[مجـازی]* وڵاتانی دەوڵەمەند ٥. زریان؛ زەلان؛ بایێ کە لە باکوورەوە دێت.

▣ **شمال باختری** ☜ **شمال غربی**

**شمال خاوری** ☜ **شمال شرقی**

**شمال شرقی:** ڕۆژهەڵاتی باکووری؛ خۆرهەڵاتی بـاکووری؛ لای نێـوان بـاکوور و ڕۆژهـەڵات: **شمال خاوری**

**شـمال غربـی:** ڕۆژاوای بـاکووری؛ خـۆراوای باکووری؛ لای نێوان باشوور و ڕۆژئاوا.

**شمالاً** / šomālan/: [عربی] *قید.* لە بـاکوورەوە؛ لـە لای باکوورەوە ‹شمالاً محدود است بـه خیابـان: لـە باکوورەوە دەگاتە شەقام›.

**شـــمالگان** / šomālgān/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. ناوچـەی جەمـسەری بـاکووری؛ مەڵـبەندی بەستەڵەکی باکوور؛ ناوچەگەلێ کە کەوتوونەتـە ژوور هێڵی ٦٥ پلەکی باکووریەوە.

**شمالی** / šomālî، ـها/: [عربی] *صفت.* بـاکووری: ١. پێوەندیدار یان سەر بە باکوورەوە ‹باد شمالی: بای باکووری› ٢. لـە لای بـاکوورەوە ‹درِ شـمالی: دەرکەی باکووری›.

**شمامه** / šamāme/: [عربی] ☜ **دَستَنبو-٢**

**شماها** / šomāhā/: ضمیر. ئێوەگـەل؛ ئێوەیـەل؛ ئێوەمانان؛ تاقمێ لە ئێوە؛ کۆی ئێـوە؛ گرۆیـەک کە ئێوەی تێدان ‹شماها مـی‌گفتیـد ایـن کـار فایـده ندارد!: ئێوەگەل دەتانگوت ئەم کارە بەهرە نادا!›.

**شمایل** / šamāyel، ـها/: [عربی]/اسم. نگارە؛ وێنە؛ سیما؛ شکڵ: ١. وێنەی دۆستانی خوا و پیرۆزان ٢. *[ادبی]* مۆر؛ دیدار؛ ڕوخسار؛ دیمەن؛ چێـرە ❋ **شمائل**

**شـــمایل‌پرســـتی** / šamāyelparastî/: [عربـی/ فارسی]/اسم. نگارەپەرستی؛ وێنەپەرستی؛ کار یان ڕەوتی پەرسـتنی وێنـە (وەک وێنـەی خوداکـان، فریشتەکان یان شتە پیرۆزەکان).

**شمایل‌سازی** / šamāyelsāzî/: [عربـی/ فارسـی] /اسم. نگارەکێشی؛ کێشانی وێنەی دۆستانی خودا و شتە پیرۆزەکان.

**شمپانزه** / šampānze/: [فرانسوی] ☜ **شامپانزه**

**شمد** / šamad ، ـها/: اسم. شەمەو؛ شەمەد؛ پۆپەژمین؛ پێخەفێکی زۆر تەنک لە کەتان یا پەموو کە هاوینان کاتی نووستن بە خۆیدا دەدەن.

**شمردن** / šomordan, šemordan/: مصدر. متعدی. // **شمردی**: ژماردت؛ **می شماری**: دەژمێری؛ **بشمار**: بژمێرە// ژماردن؛ ژمارتن؛ بژاردن؛ بژارتن؛ هەژماردن؛ هەژمارتن؛ ئەژماردن؛ ئەژمارتن؛ هەژمراندن؛ هێژمارتن؛ شماردن؛ شمارین؛ هۆمارتش؛ هوومارتش؛ ئژمارەی؛ ئەژمارەی؛ ئەژمارای: ۱. هەژمارکردن؛ ژمارەکردن؛ دیاریکردنی هەندی شتێک ‹شمردن پول: ژماردنی پارە› ۲. بە ریزگوتنەوەی ژمارە سەرەکیەکان ‹از یک تا صد شمردن: لە یەکەوە تا سەد ژماردن› ۳. حەسێبکردن؛ ناو لێبردن لە حەساوکردندا ‹دفترها را هم شمردەای؟: دەفتەرەکانیشت حەسێب کردووە؟› ٤. زانین؛ بایەخ پێدان؛ حەسێبکردن ‹او را آدم نمیشمردند: بە مرۆیان نەدەزانی›. هەروەها: **شمردنی**

■ صفت فاعلی: **شمارنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **شمرده** (ژمێردراو)/ مصدر منفی: **نشمردن** (نەژماردن)

**شمرده**[1] / šomorde, šemorde/: صفت. بە بژاردە؛ بژاردە؛ دانەدانە؛ بە چۆنیەتیەکی روون کە هەر کەس تێبگا (لە بارەی ئاخاوتنەوە) ‹بیان شمردە: وتاری بە بژاردە›.

**شمرده**[2]: قید. دانەدانە؛ بە شێوەیەکی ورد و زانراو ‹شمردە حرف میزد: دانەدانە قسەی دەکرد›.

**شمس** / šams/: [عربی] اسم. [ادبی] خۆر؛ خوەر؛ وەر؛ رۆژ؛ رۆژیار؛ رۆجیار؛ تاو؛ هەتاو.

**شمسه** / šamse/: [عربی/ فارسی] اسم. شەمسە؛ نەخشێکی رازێنەیی خۆرئاسایە کە لە هونەرە سوونەتیەکانی ئێراندا (وەک کاشیکاری، زێرکاری، گولدووری زێر و زیوسازی و...) بە کار دەروا.

**شمسه دوزی** / šamsedûzî/: [عربی/ فارسی] اسم. شەمسەدووری؛ گوڵدووری بە شێوەی شەمسە.

**شمسی** / šamsî/: [عربی] صفت. هەتاوی؛ رۆژی: ۱. سەر بە هەتاو ‹منظومەی شمسی: مەکۆی هەتاوی› ۲. پێوەندیدار بە سووڕانی گواستنەوەیی زەوین ‹سال شمسی: ساڵی هەتاوی›.

**شمش** / šemš ، ـها/: اسم. کەستەک؛ شیش؛ شمش؛ شقش؛ لۆک؛ لۆکم؛ تۆلا؛ قورسە؛ قوڵت؛ کوماچە؛ کانزای داڕێژراوەی پاڵێوراو کە بۆ گواستنەوە یان فرۆش بە شێوەی ڕێژەیەک لە ئەندازەگەلی بڕیاردراودا دروستی دەکەن ‹شمش طلا: کەستەکی زێڕ›.

**شمشاد** / šemšād/: اسم. شمشاد؛ شمشار؛ شمشاڵ؛ شەمشا؛ درەختێکی هەمیشە سەوزی ڕازێنەیی، بە گەڵای سەوزی تۆخ و بریقەدار، چێوی سفت و پتەو کە لە پیشەسازیدا بە کار دێ. ئەم دارە لە هەشت میتر بەرزتر نابێ: **شمشاد اناری؛ شمشاد فرنگی؛ کیش**

▣ **شمشاد اناری** ☜ **شمشاد**

**شمشاد پیچ**: شمشاد پێچ؛ درەختچەی هەمیشە سەوز و خزۆک بە گەڵای هێلکی دوورەنگ، گوڵی ئاڵی مەیلەو سەوز و بەری سوورەوە کە بە داریتردا دەئاڵێ و هەڵدەکشێ.

**شمشاد فرنگی** ☜ **شمشاد**

**شمشال** / šemšāl ، ـها/: [از کردی] اسم. شمشاڵ؛ کوردنای؛ قەواڵ؛ سازێکی لە بنەماڵەی بلوێر.

**شمشه** / šemše ، ـها/: اسم. شمشە؛ داری ڕاستەی بەنایی؛ ئامێرێکی چێوی یان کانزایی درێژ وەکوو خەتکێش کە بۆ تەراز بوونی کاری بەنا (لە دیوار نان یا فەرشی کەف و شتی وادا) بە کار دەڕوا.

**شمشیر** / šamšîr ، ـها/: اسم. ۱. شیر؛ شوور؛ شور؛ شمشێر؛ شمشێرد؛ شێر؛ شەمشێر؛ شمشیر؛

قلیج؛ قـلینج؛ قـلنج؛ گـۆرد؛ جـەنگ ئـامێرێکی پۆلایینە، بە دەستەیەکی کورت، تێغەیەکی درێژ و نـووکـتیـژی ڕاسـت یـان تـۆزێ لارەوە ٢. دەوەنێکی لێرەواری بە قۆتەی چـوارڕوویی، گەڵای هێلکی درێژ و بەری چوار توێژی سوور و تۆمی نارنجیەوە: **گوشوارک**

▣ **شمـشیر را از رو بـستن:** */کنـایی/* بـەرد گرتنـە مشتەوە؛ بە ڕاشکاوی و بـێمـەرایی دوژمـنی کردن ‹آن روز رییس شمشیر را از رو بسته بـود: ئـەو ڕۆژە سەرۆک بەردی گرتووە مشتەوە›.

**شمشیر را غلاف کـردن:** */کنـایی/* سـارد بوونـە؛ هاتنــە خــوارێ؛ لــە هەڕەشــە و گورەشـە دەستکێشان و سـاچان ‹وقتـی دیـد حریـف از میدان در نمی‌رود، شمـشیرش را غـلاف کـرد: کاتـێ زانی هەڤبەرەکەی لە مەیدان ناچێتـە دەر، سـارد بۆوە›.

**شمشیر زدن:** شیرکوتان؛ شمشێر وەشاندن؛ بە کار بردنی شمشێر بۆ شەڕ و پێکـدادان ‹او در راه میهنش شمشیر می‌زد: ئەو لە ڕێگەی وڵاتەکەیدا شیری دەکوتا›.

**شمشیر کشیدن:** شیرکێشان؛ شمشێر کێـشان؛ شیر لە کالان دەرکێشان؛ بـۆ شـەڕ هەسـتان ‹درست نیست دوستان به روی هـم شمـشیر بکـشند: باش نیە هەوالان لە ڕووی یەکدا شیر بکێشن›.

**شمـــشیرباز** / šamšîrbāz ، ـهـا؛ ـان/: *صـفت.* شمشێرباز؛ شمشێروەشێن.

**شمشیربازی** / šamšîrbāzî/: */اسم.* شمـشێربازی؛ شمشێروەشێنی؛ جۆرێک وەرزشـە بـۆ نوانـدنی کارامەیی کایەکەران لە شیروەشاندندا.

**شمـــشیرزن** / šamšîrzan ، ـهـا؛ ـان/: */اسـم.* شیروەشێن؛ شمشێروەشێن؛ شمشێرباز؛ کەسێ کە لە شیر وەشاندندا بە دەستوبردە. هەروەها: **شمشیرزنی**

**شمشیرماهی** / šamšîrmāhî/: */اسم.* ١. /ـها؛ ـان/ شیرماسـی؛ کلکـەموو؛ شمـشێرماسی؛ جۆرێـک ماســی خواردەمــەنی بــە قــەپۆزێکی درێــژی شیرئاســاوە کــە لــە ئێــسقانەکانی شــەویلاکی سەرووی پێکهاتووە ٢. */نجوم/* ☜ **زرّین‌ماهی** [1]

**شمـــشیری** / šamšîrî/: *صـفت.* ١. شــیری؛ شمـــشێری؛ شەمـــشێری؛ وەک شمـــشێر ٢. شــووگەر؛ شــیرگەر؛ وەســتای شمــشێر و خەنجەرساز.

**شـمع** / šam', ša:m ، ـهـا/: [عربـی]*/اسم.* شـەم؛ شەمێ؛ شەمع: ١. مـۆم؛ شمـا؛ بالمـەمی؛ مێـو؛ شەماڵک؛ شەمالک؛ شـەمانک؛ مـۆمی؛ شـەماڵ؛ شەماڵ؛ بەلمیت؛ فنـد؛ قرجەنـە؛ تیکەیـەک لـە مۆم یان چـەوری کـە پـڵیتەیەکی بـۆ ڕووناکی تێخـراوە ٢. شـەمی ماشـین؛ فەنـدەک؛ فەنـد ٣. شــەمعەک؛ پاڵــەوانە؛ فیـڵپایە؛ باڵــین؛ کۆڵەکەیەکی چێوی یان کانزایی بۆ بەرگری لـە دارمانی ماڵ (میچ یان دیوار) کە لە ژێر و پاڵـیدا دادەنرێــت ٤. یەکــەی ڕادەی ڕۆشــنایی ٥. */مجازی/* ئەوەی هۆی ڕووناکیە ‹او شمع مجلس ما بود: ئەو شەمی کۆڕی مە بوو›.

▣ **شمع جمع** ☜ **شمع محفل**

**شمع کافوری:** */ادبی/* شەمی گەچی.

**شمع گچی:** شەمی گەچی؛ مۆمی سپی کە لە پی پەتی دروستی دەکەن.

**شمع مجلس** ☜ **شمع محفل**

**شمع محفل:** */مجازی/* شەمیکۆڕ؛ شەمی جـەم؛ کەسێ کە دەبێتە هۆی گەشـاندنەوە و گـەرم بوونی کۆڕ: **شمع مجلس؛ شمع جمع**

▣ **شمع زدن:** شەم دانە ژێر شتێ ☜ **شمع ـ٣**

**شـمعدان** / šam'dān, ša:mdān ، ـهـا/: [عربـی/ فارسی]*/اسم.* لالا؛ لالە؛ شمادان؛ شەمان؛ شەمدان؛ شەمعدان؛ مۆمدان؛ فنداک؛ فنـدانک؛ شـەمدوو؛ شەمسۆز؛ دەفرێکی پایەدار بە یەک یـان چەنـد قوپکەوە کە شەمی بۆ دایساندن تێدەنێن.

**شمعدانی** / šam'dānî, ša:mdānî ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]*/اسـم.* شــەمانی؛ گوڵــەشــەمالی؛

گوڵه‌شه‌مالیه؛ گوڵێکه به زۆر ڕه‌نگه‌وه: سپی، سووری ئاماڵ پرته‌قاڵی، چێره‌یی و...

▣ **شمعدانی پیچ:** شه‌مانی پێچ؛ جۆرێ شه‌مانی که لاسکه‌که‌ی به ده‌وری پاڵه‌وانه‌یدا لوول ده‌خواته‌وه.

**شمعدانی عطری:** شه‌مانی عه‌تری؛ جۆرێ شه‌مانی ڕازێنه‌یی، به گه‌ڵای زۆر بۆنخۆشه‌وه.

**شمع‌سازی** / šam'sāzî, ša:m- /: [عربی/ فارسی] /اسم. شه‌مسازی؛ مۆمسازی: ١. کار یان ڕه‌وتی درووس‌کردنی شه‌م له مۆم، چه‌وری و... ٢. /ـها/ کارگه‌ی درووس‌کردنی شه‌م؛ کارخانه‌ی شه‌مسازی.

**شمعک** / šam'ak ، ـها /: [عربی/ فارسی]/اسم. شه‌معه‌ک: ١. مۆمک؛ که‌ره‌سه‌یه‌ک له برێک له ده‌زگاگه‌لی گه‌رماده‌ر (وه‌ک سۆپا، ئاوگه‌رمکه‌ر و...)دا که به بڵێسه‌یه‌کی لاوازه‌وه ده‌گرێ و بۆ داگرساندنی مه‌شخه‌ڵی سه‌ره‌کی ده‌زگاکه به کار ده‌ڕوا ٢. پاڵه‌وانه؛ شه‌م؛ تیرێکی چێوین یان کانزایی بۆ به‌رگری له داڕمانی ماڵ (میچ یان دیوار) که له ژێر و پاڵیدا داده‌نرێ.

**شمعکوب** / šam'kûb, ša:m- ، ـها /: [عربی/ فارسی]/اسم. [معماری] چوارچێوه‌یه‌کی پۆلایینی هه‌ڵێنه‌ر و بزوێنه‌ره بۆ هه‌ڵگرتنی تیر (کاریته) و تێڕۆ کردنی به زه‌ویدا.

**شمعی** / šam'î, ša:mî /: [عربی] صفت. شه‌می: ١. مۆمی؛ له شه‌م دروست کراو ‹مداد شمعی: قه‌ڵه‌می شه‌می› ٢. مۆماوی؛ تێکه‌ڵ به شه‌م.

**شمن** / šaman ، ـها؛ ـان /: [سنسکریت]/اسم. شه‌مه‌ن؛ پایه‌به‌رزی ئایینی شه‌مه‌ن‌په‌رستی، که به باوه‌ڕی شوێنکه‌وتوانی ده‌توانێ له‌گه‌ڵ بوونه‌وه‌رانی نادیاردا پێوه‌ندی دابمه‌زرێنێ، نه‌خۆش چا کاته‌وه و له نادیار خه‌به‌ر بدا.

**شمن‌پرستی** / šamanparastî /: [سنسکریت/ فارسی]/اسم. شه‌مه‌ن‌په‌رستی؛ دینی په‌ره‌سه‌ندوو له نێوان گه‌لانی ئوراڵ‌ـئاڵتایی باکووری ئاسیا و ئورووپا له سه‌ر بنه‌مای باوه‌ڕ به چه‌ن خودا، ڕۆحی باپیران و دێوانێ که ته‌نیا شه‌مه‌نه‌کان توانایی په‌یوه‌ندیان له‌گه‌ڵیاندا هه‌یه.

**شمول** / šumûl, šomûl /: [عربی]/اسم. داگری؛ له خۆ گری؛ کار یان ڕه‌وتی گرتنه به‌ر؛ داگرتن؛ گرتنه‌وه؛ بریتی بوون ‹موضوع از شمول این قانون خارج است: ئه‌م قانوونه داگری بابه‌ته‌که نیه›.

**شمه** / šemme /: [عربی]/اسم. نه‌ختێ؛ بڕێ؛ برێک؛ چکێ؛ هێندێ؛ کوچێو؛ هه‌ندێکی که‌م له شتێک ‹شمه‌ای درباره‌ی کارهای عروسش تعریف کرد: نه‌ختێ له‌مه‌ڕ کاره‌کانی بووکه‌که‌ی گێڕاوه›.

**شمیز** / šomîz /: [فرانسوی]/اسم. شۆمیز؛ شوومیز؛ مقه‌وا: **شُومیز**

**شمیم** / šamîm /: [عربی]/اسم. [ادبی] به‌رامه؛ به‌رام؛ بۆنی خۆش ‹برنیاید شمیم عود از بید: به‌رامه‌ی عوود له بی چۆن دێته به‌رهه‌م؟›.

**شمین** / šamîn /: اسم. [گیاه‌شناسی] گیامیزلانه؛ گیامیزڵـلانه؛ گیاکه‌ڵه‌ی ئاوی؛ ڕووه‌کێکه تووره‌که‌یه‌کی پێوه‌یه بۆگرتنی مێش و مێشووله، قه‌د و گه‌ڵاکه‌ی سه‌ر ئاو ده‌که‌وێت.

**شمینه** / šomîne ، ـها /: [فرانسوی]/اسم. شومینه؛ سۆپای نێو دیوار: **شُومینه**

**شن** / šen ، ـها /: اسم. چه‌و؛ زیخ؛ خیز؛ ڕێخ؛ ڕیخ؛ زوخره؛ زوخرۆک؛ وردکه‌به‌رد؛ قۆخ؛ خرک؛ خڕکه‌به‌رد؛ ڕێز؛ ورده به‌ردی ده‌م چه‌م؛ ورده‌ی هاڕدراوی به‌رد به ئه‌ستوورایی ٢ تا ١٠ میلیمیتر که زۆرتر له‌گه‌ڵ تمتمان به‌تایبه‌ت ماسه‌دا تێکه‌ڵه.

▣ **شن بادامی:** چه‌و؛ زیخی گرد و لووس.

**شن پولکی:** زیخی پووله‌کی؛ وردکه به‌ردێ که پانایه‌که‌ی سێ ئه‌وه‌نده‌ی ئه‌ستوورایه‌که‌یه‌تی.

**شن زبری:** ڕێخه‌زرو؛ زبره‌زیخ؛ چه‌وی زوور و ناساف.

**شن سوزنی:** زیخه ده‌رزیله؛ جۆرێک زیخه که

درێژایی سێ ئەوندەی پانایییەکەیەتی.

**شنا** / šenā/: *اسم.* ١. مەلـە؛ سۆبایی؛ شـناو؛ ئاژنی؛ مەلێ؛ لەمێ؛ بزاو لە ئاودا بـە بزوانـدنی دەست و پا، کلک یان بـاڵ ٢. *[کنایی]* مەلـە؛ مەلێ؛ لەمە؛ جووڵەی شتێک لە نێو تراوێکـدا ‹مگس مردەای توی شیشەی شربت شـنا مـی‌کـرد: مێـشێکی مـردوو لـە نێـو شووشـە شـەربەتەکەدا مەلەی دەکرد› ٣. شنۆ؛ شنەو؛ شناو؛ جۆرێـک وەرزشی زۆرخانەیی ئێرانیە: **شنُو**

**شنای آزاد:** مەلەی ئـازاد؛ مەلەیـەک کـە بـە گوێرەی دەستوورێکی تایبەت نیە.

**شنای استقامت:** جۆرێ کێبەرکێ مەلەوانیە کە مەلەوان دەبێ مەودایەکی زۆر مەلە بکا.

**شنای پروانه:** مەلەی پەروانە؛ جۆرێک مەلەیـە کە هەر دوو دەستی مەلەوان پێکـەوە لـە ئـاو دێتە دەرەوە و وەکوو باڵی پەپوولە دەبزوێ.

**شنای پشت:** پشتەمەلە؛ پەشتەمەلێ؛ مەلەی لە سەر گازی پشت. هەروەها: **شنای پهلو**

**شنای قورباغه:** سینە مەلە؛ قورواقەمەلە؛ جۆرێ مەلە وەک مەلەی بۆق کـە سـەرەتا دەسـتی مەلەوان لە درێژایی لەش، بەرەو بەر و لـەپـی دەست بەرەو خوارە، لە بزاوی دواییدا دەسـت لە دوولاوە بۆ لای لەش دەجووڵێن و پاشان پا بەرەو بەر جەم و باز دەبێتەوە و بە تەوژمـەوە دەبەسرێ.

**شنای کرال:** باسکەمەلە؛ مەلەی دەستلێدانی یەک‌نایـەک و پـای وەک پـەڕە بـان و خـوار پێکردن.

▣ **شنا رفتن:** شنۆ/ شنەو چوون ‹هر دفعه سیصد تا شنا مـی‌رفـت: هـەر جارێـک سێـسەد دانـە شـنو دەچوو› ☜ **شنا ـ ٣**

**شناخت** / šenāxt، ـها/: *اسم.* ناسـیاری: ١. کـار یان ڕەوتی ناسان؛ ناسین؛ شناسـین؛ بـریتی لـە هایایی و داوەری ٢. زانیـاری؛ زانـست؛ زانـاهی؛ بەرهەمی ئـەم کـارە ‹او شـناخت کـاملی از حـوادث نداشـت: ئـەو ناسـیاریەکی تـەواوی لـە ڕووداوەکـان نەبوو›. هەروەها: **شناخت داشتن**

**شـــناخت‌شناســـی** / šenāxtšenāsî/: *اسـم.* ناسیاری‌ناسی؛ زانیاری‌ناسی؛ لێکۆڵینەوەی چەن و چلۆنی لێهاتوویی مرۆ بۆ ناسینەوەی ڕاستی و سەرچاوەکانی، شـێوە و شـێوازگەلی ناسـیاری، ڕاستی و ڕێگەگەلی پێ گەیشتنیان.

**شناختن** / šenāxtan/: *مصدر. متعدی.* // **شـناختی:** ناسیت؛ **مـی‌شناسـی:** دەناسـی؛ **بـشناس:** بناسـە // ناسین؛ ناس‌کرن؛ شناسین؛ ئژناسەی؛ ئەژناسای؛ ئژناسـین؛ نیاسـین؛ شناسـای؛ ڤەناسـین؛ ئەوەژناسـەی: ١. وە بـیر هێنانـەوە یـان لێک‌جیاکردنەوەی کەسێ یان شـتێک بـە پێـی ئاگـاداری پێـشوو ٢. لـە چۆنیـەتی و دەروونی کەسێ یـان شـتێک ئاگـا بـوون ‹مـن او را خـوب شناخته بودم: من ئەوم بە باشی ناسـیبوو› ٣. لەمـەڕ کەسێ داوەری یان باوەڕێکی تایبـەت هـەبوون ‹همه او را به مردانگـی و دسـت‌ودلبـازی مـی‌شـناختند: هـەموان ئـەویان بـە پیـاوەتی و دەسـت‌ودڵـبازی دەناسـی› ٤. ئاشـنا بـوون لەگـەڵ کـەس یـان شتێکدا ‹همەی کس و کارش را می‌شـناخت: هـەموو کەس‌وکـاری دەناسـی› ٥. ناسـینەوە؛ ڤەناسـین؛ شناسایوە؛ ئەوەژناسەی؛ بەجێ‌هێنان ‹بعضیشان را اگر می‌دیدی، نمـی‌شـناختی: بـڕێکیانت ئەگـەر بـدیبا، نەتدەناسینەوە›. هەروەها: **شناختنی**

■ صفت فاعلی: **شناسنده** (ناسەر)/ صفت مفعولی: **شناخته** (ناسراو)/ مصدر منفی: **نشناختن** (نەناسین)

**شـناخته** / šenāxte، ـهـا، ـگـان/: *صفت.* ناسـراو؛ ناسیاگ؛ ناسیاو؛ بەناوبانگ؛ ناودار؛ ئەژناسـیا ‹آدم شناخته‌ای است: مرۆیەکی ناسراوە›.

**شـــنازی** / šenāzî/: *صـفت.* مەلـــەژێ؛ بـــە تایبەتمەندی یان توانایی مەلـەکردن و بـزاو لـە نێو ئاودا بۆ ماوەیەکی زۆر (وەک ماسی و باڵۆن).

**شناس** [1] / šenās/: *اسم. [گفتاری]* ئاشـنا؛ شـناس؛ ژناس؛ ئەژناس؛ ناس ‹با پدرم شناس است: دەگـەڵ

بابم ئاشنایە›.

**ـ شناس**[2]: *پیواژە*. ـ ناس؛ـ شناس؛ـ ئەژناس؛ ناسەر، کەسێ کە شتێک دەناسێ یان دەگەڵیدا ئاشنایە ‹آبشناس؛ زیستشناس: ئاوناس؛ ژیوارناس›.

**شناسائی** / šenāsā'î/ ☜ **شناسایی**

**شناساگر** / šenāsāgar/: *اسم. [شیمی]* هەر یەکە لەو ماکانە کە بە هۆی گۆڕینی لەناکاوی ڕەنگ، سەرەنجامی کاردانەوەیەکی کیمیایی ڕوون دەکەنەوە و زۆرتریش لە شیکردنەوەی بارستایدا بەکاردێن.

**شناساندن** / šenāsāndan/: *مصدر. متعدی.* // **شناساندی**: ناساندت؛ **می‌شناسانی**: دەناسێنی؛ **بشناسان**: بناسێنە// ناساندن؛ پێناساندن؛ دانەناسکرن؛ دانەنیاسین؛ پنەژناسەی؛ شارەزایی دان بە دیتران لەمەڕ چۆنیەتی کەسێ یان شتێکەوە: **شناسانیدن**. هەروەها: **شناساندنی**

■ صفت فاعلی: **شناساندە** (ناسێنەر)/ صفت مفعولی: **شناسانیدە** (ناسێنراو)/ مصدر منفی: **نشناساندن** (نەناساندن)

**شناسانیدن** / šenāsānîdan/ ☜ **شناساندن**

**شناسایی** / šenāsāyî، ـها/: *اسم.* شناسایی؛ کار یان ڕەوتی ناسینەوە: ۱. ناسینی چۆنیەتی شتێ یان پێناسەی کەسێک ‹شاهد متهم را شناسایی کرد: شایەت تاوانبارەکەی ناسیەوە›. هەروەها: **شناسایی دادن؛ شناسایی کردن** ۲. *[سیاست]* بە فەرمی ناسینی دەوڵەت یان بار و دۆخێک لە لایەن دەوڵەت یان دەوڵەتانی ترەوە ‹کشورهای عرب دولت فلسطین را شناسایی کردند: وڵاتە عەرەبیەکان دەوڵەتی فەلەستینیان ناسیەوە› ❋ **شناسائی**

▣ **شناسایی دوژور**: *[سیاست]* ناسینەوەی دوژوور؛ ناسینەوەی فەرمی دەوڵەتێک لە لایەن دەوڵەتێکیترەوە کە هاوڕێ لەگەڵ دامەزرانی تەواوی پەیوەندیگەلی ڕامیاریدایە.

**شناسایی دوفاکتو**: *[سیاست]* ناسینەوەی دوفاکتۆ؛ ناسینەوەی سنووردار و کاتی دەوڵەتێک، بەبێ دامەزرانی تەواوی پەیوەندیگەلی ڕامیاری.

▣ **شناسایی‌دادن**: شناسایی دان؛ خۆ پێناساندن؛ ئاشنایی دان؛ زانیاری دان بە کەسێک بۆ ناساندنی خۆ بە ئەو ‹وقتی شناسایی دادم، مرا شناخت: کاتێک ئاشناییم دا، ناسیمیەوە›.

**شناسنامە** / šenāsnāme، ـها/: *اسم.* ناسنامە؛ پێناسە؛ سەرنامە؛ شناسنامە: ۱. بەڵگەی فەرمی ناسینەوەی هەر کەس، کە بە شێوەی دەفتەرچە یان لاپەڕەیەکی دەوڵەتی، کە ناو، ناوی بنەماڵە و ئاگاداریگەلی‌تر لە پێوەندی ئەو کەسەی تێدا نووسراوە: **سجل** ۲. دەفتەرچە یان لاپەڕەیەک کە ئاگاداریگەلی پێوەندیدار بە بابەت یان کەسێکی تێدا دەنووسرێت ‹شناسنامەی بهداشتی: ناسنامەی تەندروستی›.

**شناسنامە ای** / šenāsnāme'î/: *صفت.* ناسنامەیی؛ پێناسەیی؛ سەرنامەیی؛ شناسنامەیی؛ پێوەندیدار یان پاڵدراو بە ناسنامەوە ‹مشخصات شناسنامەای او را یادداشت کنید: دیاریکراوە ناسنامەیەکانی بنووسن›.

**شناسە** / šenāse، ـها/: *اسم.* ناسە: ۱. *[دستور]* بەشێک لە کردار کە پێشاندەری کەس یان ژمارەیە و بە شوێن ڕەگی کردارەوە دێت ۲. کود؛ کۆمەڵێک لە نیشانەگەل (ژمارە، پیت یان وشە) کە بۆ واتاییکی دیاریکراو و زۆرتر نهێنی بە کار دێ.

**ـ شناسی** / šenāsî/: *پیواژە*. ـ ناسی؛ ناسینەوەی شتێک یان زانستی پێوەندیدار بەو شتەوە ‹آبشناسی؛ جانورشناسی؛ زیستشناسی: ئاوناسی؛ گیانەوەرناسی؛ ژیناسی›.

**شناعت** / šenā'at, šanā'at، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ناشیرینی؛ دزێوی؛ کرێتی؛ نەچێیی؛ ناحەزی؛ خراپی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دزێو بوون.

**شـــناگاه** / šenāgāh/:*اسـم.* پـلاژ؛ ڕۆخـــەوار؛ ئاوبازگـــە: ١. شـــوێنی تـــەخت و خـــۆش بەرجەوەنـدی قـەراخی ئـاو ٢. مـاڵ و سـامانی دروستکراو لەو شوێنەدا.

**شناگر** / šenāgar ، ـها؛ ـان/:*اسـم.* مەلەوان؛ ئاوباز؛ مەلەزان؛ ئاڤژەن؛ مەلەڤان؛ سـۆبا؛ سـۆبایی‌کـەر؛ مەلۆو: ١. کەسێ کە مەلە دەزانێ ٢. کەسێ کە مەلە دەکا. هەروەها: **شناگری**

**شـــناور**[1] / šenāvar ، ـهـا/:*اسـم.* سـەرئاو: ١. کەرەستەیەکی گواسـتنەوەیی کـە بـە سـەر ئاودا بڕوا (وەک گەمیە) ٢. ئـامرازێکی سـووک و هلۆڵ بە سەر خەزینەی تراوێکەوە و بەسـراو بـە شێری تراوەکەوە، کە داکـشانی ئاسـتی تـراوی خەزێنەکـە، دەبێتـە هـۆی ڕژانی و هەڵکـشانی ئاستی دەبێتە هۆی بڕانی.

**شناور**[2]:*صفت.* ١. سەر ئاو؛ بە توانایی یان شیانی لـە سـەر ئـاوەوە بـزوان ٢. *[گفتـاری]* گـەوزاو؛ ڕۆچووگ بە ناخی ئاودا.

**شـناوری** / šenāvarî/:*اسـم.* سـەرئاوی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی بوونی شتێک لە سەر یان لـە نێـو تراوێکدا ٢. دۆخ یان چۆنیەتی ڕاگرتنی لەش لە نێو ئاودا.

**شناوه** / šenāve/:*اسـم.* ئامرازێکی دە ئاو گـەوزاو بۆ گەزگرتنی قوولایی ئاو.

**شنبلید**/ šanbalîd /:*اسم.[گیاه‌شناسی]* سوورەجان؛ گیایێکـە گـوڵـەکەی لـە ڕەحـەتی دەچـێ، پێنج‌پەڕەی هەیـە و ڕەنگـی سـووری مەیلـەو پەمەییە و بۆ دەرمان دەبێ.

**شـنبلیله** / šambalîle, šanbalîle ، ـهـا/:*اسـم.* شـەمبەلیک؛ شـەمبلیلک؛ شمـڵی؛ شمـڵیە؛ شەملیە؛ حەوینج؛ گیایـەکی شـین لـە بیچمـی وێنجە بـە گوڵـی سـپی یـان زەردەوە، تـامێکی توندی هەیە.

**شـــنبه** / šambe, šanbe ، ـهـا/: [آرامـی]*اسـم.* شەممە؛ شەمە؛ شەمبۆ؛ شەم؛ شـەمی؛ شـەمبە؛ نێـوی ڕۆژی یەکـەم و دەسـپێکی حەفتـەی ئێرانی، پاش لە هەینی و پێش لە یەک‌شەممە.

**شنبه‌شب** / -šambešab, šanbe ، ـها/: [آرامی/ فارسی]*اسم.* شەوی یەک‌شەممە؛ شـەوی شـەمە لە سەر یەک‌شەمە؛ شەوی پاش ڕۆژی شەمە.

**شن پاش**/ šenpāš/:*اسـم.* لم‌پـاش؛ قوتـووی لم؛ خەزێنەیێکی چکۆلە لە واگۆنی قەتاردا کە لمـی تـێ کـراوە و بـۆ بـەرگری لـە خـزان یـا لادان بەرە-بەرە لێوە دەوەرێ.

**شنجار** / šencār/:*اسم.[گیاه‌شناسی]* ☜ **شنگار**

**شـــنجرف** / šancarf/: [معـــرب از فارســـی] ☜ **شنگرف**

**شندرغاز** / šenderqāz/:*اسم.[گفتاری]* قەرەپووڵ؛ پـەنابا؛ دووقـڕان؛ فلـسێ؛ پـارەی چـرووک؛ پارەیەکی یەکجار کەم ‹با این شندرغاز چه می‌شـود خریـد؟؛ آخـر مـاه شـندرغاز گذاشـت کـف دستم: بـەم قەرەپوولە چی بکرم؟ ئاخری مانگ پەنابایەکی نایـە نێو دەستم›: **چندرغاز**

**شـــندروپندر** / šender-o-pender ، ـهـا/:*اسـم.* *[گفتاری]* شڕ و وڕ؛ شڕ و شیتاڵ؛ پەڕۆکۆنە؛ بزگوڕ؛ تیتـۆڵ؛ سیپاڵەشـڕە؛ جـلوبـەرگ و پارچـەی داڕزاو: **کهنه‌پاره**

**شندره** / šendere ، ـها/:*صفت.[گفتاری]* شڕ؛ شڕە؛ کۆنە (زۆرتر لەمەڕ جلوبەرگەوە).

**شندره‌پوش** / šenderepûš ، ـها/:*صفت.[گفتاری]* شڕەبار؛ شڕەپۆش.

**شندوست** / šendûst/ ☜ نی شنی، **نی**

**شـــنریزی** / šenrîzî ، ـهـا/:*اسـم.* چـەوڕێژی؛ زیـخڕێـژی؛ شـینڕێـژی؛ کـاری پڕکردنـەوەی بنەڕەتی خانوبەرە یان داپۆشانی ئاستی جادە بە وردکە بەرد و زیخ.

**شنزار** / šenzār ، ـها/:*اسم.* ڕیخـەلان؛ زیخـەلان؛ خیزەلان؛ خرپ؛ زوخرۆنک؛ زوخرۆنەک؛ زیخگە؛ چەولگ؛ شخەڵ؛ زخدان؛ کەوڵە؛ کەوەڵە؛ شوێن یان زەوینێکی بیاوانی کە زیخی زۆری لێیە.

**شنفتن** / šenoftan/ ☜ **شنیدن**
**شـنقار** / šonqār ، ـهـا/: [ترکـی]/اسم. شمقـاڕ؛ مەلێکی ڕاوکەرە لە باز بەهێزتر و جوانتر.
**شـن کـش** / šenkeš ، ـهـا/:/اسم. نگێـر؛ شـانە؛ چـەوکێش؛ شـەن کـێش؛ درەغ؛ خـاکـژن؛ پاچـەکولـە؛ ئـامرازێکی دەم بـەرەوخوار، وەک چنگاڵـیکی زۆر گـەورەیـە بـۆ پـاک کردنـەوەی زەوینی جێ کشتوکاڵ لە زیخ و کەن و کولۆ.
**شنگ** / šeng ، ـها/:/اسم. شـنگ؛ شـنگی؛ شـن؛ ئەسپنگ؛ ئەسپینگ؛ سپنگ؛ سپینگ؛ گیایەکی ئالیکی دووسالان بە شـیلەی سـپی و چەسـپن، گـەڵای زراڤ و درێـژەوە، سـەوزەمەنیەکی خۆراکی و خۆڕسکی کوێستانیە.
▣ **شنگ ترە بی:** هەڵەکۆک؛ هەپلۆک.
**شنگ چمنی:** بزنەڕیشە؛ گیایێکی ئالیکی و پایا و بـێ‌لاسـک بـە گـەڵای درێـژ و باریـک و سەوزەوە کە لە ڕیشی بزن دەکا.
**شنگار** / šangār ، ـها/:/اسم. شـەنگال؛ شـەنگار؛ دۆشـاومژە؛ دانۆکەقـەلا؛ چەرمـەژووری؛ پێکۆترە؛ کاهووە کەرانـە؛ جاوبـازە؛ گـیایێکی ئـالیکی، بـە گـەڵای درێـژ، گوڵـی ئـاوی بـە کۆمـەڵ، ڕیـشووی سـووری ئامـاڵ بنـەوش، لاسکی نووساوە بە گەلاکانی و بە هەودای زرو داپۆشراو، ڕازاندنەوەییە و ماکێکی سووری لێ بەرهـەم دێ کـە بـۆ ڕەنـگ کـردن دەبـێ و کەڵکی دەرمانیشی هەیە: **شنجار؛ شنگال**
**شنگال** / šangāl/ ☜ **شنگار**
**شـنگرف** / šangarf/:/اسم. ١. کانیـەکی سـوورە جیـوەی لـێ بەرهـەمدێ ٢. ژەنگبـەر؛ ڕەنگـی سووری تۆخ و خـۆگر لـە هەمبـەر ئەسـیدگەلی ئاساییەوە کە پێشووتر لە کانی شەنگەر دروست دەکرا بەلام ئەمڕۆکە بە شـێوەی لێکـدراو چـێ دەکرێ ✻ **شنجرف**
**شنگرفی** / šangarfî/: صفت. بە ڕەنگـی سـووری ئاماڵ نارنجی.

**شـنگ‌رودخانـه** / šengerûdxāne ، ـهـا/:/اسم. سمۆرەئاوی؛ گیانـەوەرێکی گوانـدار لـە تـیرەی فسۆس بە جەستەی درێژ و باریک، پێی کورت، سەری پان، پەنجەی پـەردەدار و کلکـی پـان و سافەوە: **سمور آبی؛ سمور رودخانه؛ گربەی دریایی**
**شـنگول** / šangûl/: صفت.[گفتاری] شـەنگۆڵ؛ کەیفخۆش؛ چەلەنگ؛ زۆر ساز و لە سەر کـەیف و دڵخۆش.
**شـنگول‌ومنگـول** / šangûl-o-mangûl/:/اسم. تیتل و بیبل؛ تیتیل و بیبیل؛ نێوی بێچووەکانی چیرۆکی بزنی زەنگۆڵە لە پێ.
**شـنگولی** / šangûlî/:/اسم.[گفتاری] شەنگۆڵـی؛ دڵخۆشـی؛ بـەدەماخی؛ سـەرکەیفی؛ کەیف‌خوشـی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی سـەرکەیف بوون.
**شـنگیدن** / šangîdan/: مـصدر. لازم.[گفتـاری] // **شنگیدی:** شنیت؛ **می‌شـنگی:** دەشـنی؛ **بـشنگ:** بـشنێ// شـنین؛ شـنیان: ١. کەوتنـە هاشـی ئەویندارییەوە ‹بالای ٤٠ سال داشت، اما هنوز دلش برای دخترمدرسەها می‌شـگنید: ٤٠ ساڵـی پتـر هـەبوو، بەلام هێشتا دڵی بۆ کچە مەدرەسەیەکان دەشـنی› ٢. واز لە ئەویندارى بوون ‹بعضی از ایـن دخترهـا می‌شنگند و منتظرند روی خوش ببینند: برێ لەم کچانە دەشنن و چاوەڕوانن لایان لێ بکرێتەوە›.
**شنل** / šenel ، ـها/: [روسی]/اسم. تەرگە؛ کۆڵـوانە؛ چارەکەی کۆڵ؛ جلکێکـی گوشـادی بـێ‌قـۆڵ و درێژ کە لە سەر بـەرگی‌تـرەوە بـە سـەر شـاندا دەدەن.
**شنو** / šeno/ ☜ **شنا۔۲**
**۔ شنو** / šeno:, šeno/: پیـواژە. ۔ بـیس؛ ۔ ژنـەو؛ بژنەو ‹حرف‌شنو: قسەبیس›.
**شنوا** / šenavā/: صفت. شـنەوا؛ ژنـەوا؛ خـاوەن توانایی بیستن.
**شنوائی** / šenavā'î/ ☜ **شنوایی**
**شنواندن** / šenavāndan/: مصدر. متعدی. بە گوێ

گەیاندن؛ بە گوێدا دان؛ ئەنەگۆش دەی؛ یاونەی گـۆش؛ گەیاندنـە گوێچکـە: ١. بـۆ بیـستنی دەنگێک کەسـێک هەڵـپێچان ٢. دەنگێـک بـە گوێی دیتران گەیاندن.

**شنوایی** / šenavāyî/: *اسم.* ژنـەوایی؛ شـنەوایی: ١. ڕەوت، کـار یـان توانـایی وەرگـرتنی دەنـگ ٢. ئەو هەستە کە بە هۆی گوێـوە کـار دەکـا ❊ **شنوائی**

**شـنواییسـنج** / šenavāyîsanc ، ـهـا/: *اسم.* ژنەواییپێو؛ دەزگایەک بە ئامرازی ئیلیکترونیکی و کارەباییـەوە بـۆ پێـوانی ڕادەی ژنـەوایی و تایبەتمەندیـەکانیتـری دەنـگبیـستن: **شنوایینگار**

**شـنوایی‌سـنجی** / šenavāyîsancî/: *اسـم.* ژنـەواییپێـوی؛ کـار یـا ڕەوتی توێژینـەوەی چەندیەتی هێزی ژنەوایی کە زۆرتر بە مەبەستی ناسینەوەی کەم و کووڕیگەلیەتی.

**شـنوایینگـار** / šenavāyînegār/ ☜ **شنواییسنج**

**شـنود** / šunûd, šenûd, šonûd/: *اسـم.* ١. گوێگری؛ گوێهەڵخەری؛ کار یان ڕەوتی گوێ لێگـرتن؛ تۆمـارکردنی وتوویـژی تەلـەفوونی، بـێسـیمی یـان بەرنامەیـەکی ڕادیـۆیی بـە مەبەسـتی ڕامیـاری، سـەربازی یـان دادگـەری ٢. *[نامتـداول]* بیـسەری؛ ژنـەفتنی؛ کـار و ڕەوتی بیستن.

**شـنودن** / šunûdan, šenûdan, šonûdan/ ☜ **شنیدن**

**شنونده** / šenavande ، ـها؛ ـگـان/: *اسـم.* بیـسەر؛ گۆهدار؛ گوێگر؛ گوێدار؛ گوێدێر؛ گوێدەر؛ کەسێ کـە بـە وتـار، ئاخـاوتن، ئاهـەنگ، سـتران یـان بەرنامەیەکی ڕادیۆیی گوێ دەدا ‹نباید شـنونده را خسته کرد: نابێ بیسەر ماندوو بکرێ›.

**شنی**[1] / šenî/: *اسم.* شنی؛ زنجیرێک لە ڕووپەڕی پۆلایین بۆ بزاوتنی ماشـینگەلی قـورس (وەکـوو تانک) لـە زەویـنی نارێکـدا، لـەبـری لاسـتیکی چەرخ بە کار دەڕوا.

**شـنی**[2]: *صفت.* زیخـەلان؛ ڕیخـەلان؛ خیـزەلان؛ چەوی ‹ساحل شنی: کەرخی زیخەلان›.

**شنیتـسل** / šenîtsel/: [آلمـانی] *اسـم.* شنیتـسێل؛ خۆراکێ لە گۆشتی گوێرەکە یان مریشک کە لە نێو ئاردی بە هەزوێلەوە تلابێتەوە و پاشان سوور کرابێتەوە.

**شـنیداری** / šenîdārî, šanîdārî/: *صـفت.* بیـسیاری؛ بیـستنی؛ بیـسەری؛ گوێـداری؛ گۆهداری؛ پێوەندیدار یـان سـەر بـە بیستنەوە ‹آموزش شنیداری: ڕاهێنانی بیسیاری›.

**شـنیدن** / šenîdan, šanîdan/: *مـصدر. متعـدی.* // **شنیدی**: بیستت؛ **مـی شـنوی**: دەبیسی؛ **بـشنو**: بیبـسە// بیـستن؛ بیـسین؛ بیـسن؛ بەهیـستن؛ بهیستن؛ ژنەفتن؛ شنەفتن؛ ئشنەفتن؛ شنەوتن؛ ژنەوتن؛ ئەژنەوتن؛ ئژنەفتن؛ شـنەوتن؛ ژنـەوین؛ ئژنیـەی؛ ئەژنیـەی؛ شـنەفتەی: ١. وەرگـرتنی دەنگ بە هۆی هەستی ژنەواییەوە ‹صدایی شنیدم: دەنگێکم بیـست› ٢. بە ناوەڕۆکی دەنگێک زانین (وەکوو ناوەڕۆکی قسەیەک کە دەگـوترێ) ‹شـنیدم چه گفتی: بیستم چیت گـوت› ٣. لە ڕووداوێک بـە هۆی گوێوە ئاگادار بـوون ‹شـنیدم کـه زن گرفتـی: بیـستم ژنـت خواسـتووە› ٤. *[مجـازی]* لـە بـۆنی شتێک تێگەیشتن ‹بوی بدی شنیدم: بۆنێکی پیسم بیست› ٥. *[مجـازی]* گـوێ/ گوێچکـەدان؛ گـوێ شلکردن؛ گۆهدان؛ دەگوێگرتن؛ گـۆش دەی/ دای؛ قسە چوونە گوێچکەدا؛ گۆش شلکەردەی؛ قـسەی کەسـێک وەرگـرتن و بەرامبـەری جووڵانەوە ‹باید حرف بزرگتر را شنید: دەبێ بە قسەی گەورەتر گـوێ بـدری› ٦. ڕووبـەرووی قـسەیەک بوونەوە و بـە ناچـار ئـەو قـسە بیـستن ‹تعریـف شنیدن؛ فحش شنیدن: چاکە بیستن؛ جنێو بیـستن›. **شنودن** *[ادبی]*؛ **شنفتن***[گفتاری]*. هەروەها: **شنیدنی** ■ صفت فاعلی: **شنونده** (بیـسەر)/ صـفت مفعولی:

**شنیده** (بیسراو)/ مصدر منفی: **نشنیدن** (نەبیستن)

**شنیع** / 'šanî/: [عربی] *صفت*. ناشیرین؛ دزێو؛ نەچێ؛ سک؛ ناحەز؛ هۆی بێئابڕوویی و سووکایەتی ‹عمل شنیع؛ رفتار شنیع: کاری ناشیرین؛ ئاکاری ناحەز›.

**شو**[1] / šow, šo: ، ـها/: [انگلیسی] *اسم*. شۆ؛ شەو؛ بەرنامەیەکی شانۆگەری (بەتایبەت لە تەلەڤزیۆندا) کە بریتیە لە هونەرنوێنی جۆراوجۆر (وەک هەڵپەڕکێ، گۆرانی، شانۆگەری و کێبەرکێ).

**ـ شو**[2]: *پیواژه*. ــ هەڵگر؛ ـ پەژێر ‹تاشو: چینهەڵگر›.

**شو**[1] / šû/ ☜ **شوی**

**ـ شو**[2]: *پیواژه*. ـ شۆر؛ ـ شوور؛ ـ شوار؛ ـ شوش؛ بشۆر ‹رختشو: جلشور›.

**شوا** / šowā ، ـها/: *اسم*. پۆرگ؛ پۆلکە؛ گوراو؛ پینە؛ ئەستوور بوونەوەی پێستی دەست بە هۆی کار پێکردنی زۆرەوە.

**شوارع** / 'šavāre/: [عربی] جمعِ ☜ **شارع**

**شوال** / šavvāl/: [عربی] *اسم*. شەوال؛ مانگی دەیەمی کۆچی‌مانگی.

**شوالیه** / šovāl(i)ye ، ـها/: [فرانسوی] *اسم*. شوالیە؛ شاسوار؛ جەنگاوەری ئورووپای ڕۆژاوایی لە سەدەکانی ناوەندیدا، کە خزمەتی بە شا و دەرەبەگان دەکرد.

**شواهد** / šavāhed/: [عربی] جمعِ ☜ **شاهد**

**شوئی** / šû'î/ ☜ **ـ شویی**

**شوت**[1] / šût ، ـها/: [انگلیسی] *اسم*. *[ورزش]* شووت؛ شەپ؛ کاری خستنی تۆپ.

▣ **شوت زدن**: شووت لێدان؛ بە لێدانی دەست یان پێ شتێک (وەکوو تۆپ) هاویشتن.

**شوت کردن**: شووت‌کردن؛ فڕێدان یان هاویشتنی شتێک بۆ مەودایەکی دوور.

**شوت**[2]: *صفت. [گفتاری، کنایی]* پەرت؛ گەمژە؛ نەزان و دەبەنگ.

**شوخ** / šûx/: *صفت*. ١. شۆخ؛ حەنەکچی؛ هەنەکچی؛ گاڵتەچی؛ چەلەنگ؛ تیتاڵ؛ قسەخۆش ‹آدم شوخ: مرۆی شۆخ› ٢. دڵباز؛ دڵشادکەر؛ شادیهێن ‹رنگ شوخ: ڕەنگی دڵباز› ٣. شۆخ؛ شاد؛ بەکەیف؛ ساز؛ دڵخۆش؛ شا ٤. *[ادبی]* جوان؛ شۆخ و شەنگ؛ لەبار؛ چەلەنگ؛ شۆخ و جوان ‹از چشم شوخش حذر کن: لە چاوی جوانی خۆت بپارێزە›.

**شوخ‌چشم** / šûxčešm ، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* بێچاوڕۆ؛ بێ‌چاوەڕۆ؛ ڕووداماڵیاگ؛ بێ‌حەیا؛ بەڕوو؛ ڕووداماڵاو؛ ڕووهەڵماڵاو؛ ڕووقایم؛ بێ‌ڕۆ؛ باتیزک؛ باتیزۆک؛ ڕووتەخت؛ دۆقدۆقە؛ چەقەسۆ؛ چەتاوەسۆ؛ چارداوەڕوو؛ چەتاوەڕوو.

**شوخ‌طبع** / 'šûxtab ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت*. دەلکی؛ جەفەنگ‌باز؛ حەنەکچی؛ شۆخ؛ خۆش؛ قسەخۆشی گاڵتەکەر. هەروەها: **شوخ‌طبعی**

**شوخ‌وشنگ** / šûx-o-šang ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* شۆخ‌وشەنگ؛ خۆش‌وبێ‌خەم؛ سەرحاڵ؛ بەکەیف ‹جوانهای شوخ و شنگی بودند و ظاهراً نشانه‌ای از ترس و نگرانی در آنها دیده نمی‌شد: لاوانێکی شۆخ‌وشەنگ بوون و لە ڕواڵەتیاندا ترس و نیگەرانیەک نەدەبینرا›.

**شوخی** / šûxî ، ـها/: *اسم*. شۆخی؛ گاڵتە؛ دەگەل؛ گەمە؛ قەرف؛ گاڵتە و گەپ؛ تیتاڵی؛ تەڵفیس؛ تەڵفیز؛ گەمە و گەپ: ١. حەنەک؛ نمار؛ گەپ؛ جەفەنگ؛ تەوزە؛ لاقرتی؛ لاقردی؛ لاقرتیێ؛ قسەیەک کە بۆ پێکەنینی دیتران دەگوترێ ‹شوخیهای بامزه‌ای تعریف می‌کرد: شۆخیگەلێکی خۆشی دەکرد› ٢. کازە؛ گوندەڵ؛ تەتەڵەمیران؛ ئاکاری بە گەپ و گاڵتە و شۆخی دەگەڵ کەسێکدا ‹با بزرگتر از خودت شوخی نکن!: دەگەڵ گەورەتر لە خۆتدا گاڵتە مەکە!› ٣. سەرزارەکی؛ کار و ڕەوت یان وتەی ڕواڵەتی نەک ڕاستەقینە. بەرانبەر: **جدّی** ‹خلبانی شوخی نیست، باید همیشه حواست جمع باشد: فڕۆکەوانی

گاڵتە نیە، دەبێ هەمیشە وشیار بی›.

◘ **شوخی خرکی:** شۆخی کەرانە؛ شۆخی گەوجانە؛ شۆخی نەفامانە؛ شوخی دوور لە ژیری و ئاکار جوانی.

◘ **شوخی برنداشتن** ☜ **شوخی سر کسی نشدن– ٢**

**شوخی داشتن:** شۆخی بوون؛ دەگەڵ کەسێکدا جاروبارە شۆخی کردن ‹ما باهم شوخی داشتیم و سر به سر هم می‌گذاشتیم: ئێمە پێکەوە شۆخیمان هەبوو، سەرمان دەنایە سەر یەکتری›.

**شوخی سر کسی نشدن:** ١. شۆخی هەڵنەگرتنی کەسێک؛ لە شۆخی تێنەگەیشتن یان بەرگەی نەگرتن ‹مگر تو شوخی سرت نمی‌شود: مەگەر تۆ شۆخی هەڵناگری› ٢. *[مجازی]* شۆخی هەڵنەگرتن؛ شۆخی نەبوون؛ جێی مەترسی بوون ‹جنگ شوخی سرش نمی‌شود: شەڕ شۆخی هەڵناگرێت›: **شوخی برنداشتن**

**شوخی گرفتن:** کایە هاتن؛ گەمەگەیین؛ حەز بە شۆخی‌کردن ‹تو هم مثل این‌که شوخی‌ات گرفته: وا دیارە تۆیش کایەت دێ›.

**شوخی نبودن:** گاڵتە نەبوون؛ گەمە نەبوون؛ شۆخی نەبوون؛ کایە نەبوون ‹ادارەی مملکت که شوخی نیست: بەڕێوەبردنی وڵات خۆ گاڵتە نیە›.

**شوخی‌بردار** / šûxîbardār/: *صفت. [مجازی]* شۆخی‌هەڵگر؛ جێی گەپ و گاڵتە ‹کنکور شوخی‌بردار نیست: کونکوور شۆخی‌هەڵگر نیە›.

**شود** / ševed/ ☜ **شِبِت**

**شور** / šowr, šo:r ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ڕابێژ؛ ڕاوێژ؛ ڕاوێژکاری؛ ڕاوێژیاری.

◘ **شور کردن:** ڕاوێژکردن؛ بیر و ڕاپرسین و گۆڕینەوە ‹شور کردند بلکه راهی برای آشتی پیدا کنند: ڕاوێژیان‌کرد بەشکوو چارەیەک بۆ ئاشتی بدۆزنەوە›.

**شور**[1] / šûr/: *اسم.* ١. ئاژاوە؛ بشێوی؛ پشێوی؛ بشێوە؛ کەتن؛ خارۆرە؛ ئاشۆ؛ ئاشوو؛ ئاڵۆزی؛ کێشە و هەرا؛ ئاژاولە؛ ئاژاولێ؛ کەس‌لەکەسی ‹شور و غوغا: ئاژاوە و قرموقاڵ› ٢. هەوا؛ شۆر؛ زیچ؛ هەیەجان ‹شور جوانی: هەوای لاوەتی› ٣. دڵەڕاوکێ؛ دڵەخورپێ؛ دڵخورتی؛ هەلەبەل؛ قا ‹کجا بودی؟ دلم شور افتاد: لە کوێ بووی؟ کەوتمە دڵەڕاوکێ› ٤. شوور؛ گەورەترین دەزگای مووسیقای ئێرانی ٥. *[گفتاری]* شۆڕ؛ شیو؛ کار یان ڕەوتی شۆردنەوە ‹از شور خوب درنیامد: لە شور باش دەرنەهات›.

◘ **شور افتادن:** پەشێوان؛ پەشێو بوون؛ ئارۆزیان؛ وروژان؛ هورووژان؛ شڵەژان.

**شور چیزی را درآوردن:** بێ‌تام‌کردن؛ لە تام دەرکردن؛ لە شۆ دەرکردن؛ لە کارێکدا زێدەڕۆیی‌کردن ‹تو دیگر با این کارهایت شور شلختگی را درآوردی: تۆ ئیتر بەم کارانە لە شپرزەییدا بێ‌تامت کردووە›.

**شور رفتن:** *[گفتاری]* چوونە ئاو؛ ئەنەورێ لوەی؛ کورت بوونەوەی پارچە یان جل‌وبەرگ بە هۆی شۆردنەوە ‹پیراهن را شستم، شور رفت: کراسەکەم شۆرد، چووە ئاو›.

**شور زدن:** هەوڵ بوون؛ هەژقین؛ هەژان؛ هەژیان؛ هەوڵی شتێک بوون ‹دلم شور آزاد را می‌زند: هەوڵی ئازادمە›.

**شورواشور کردن:** *[گفتاری]* شۆراوشۆرکردن؛ لەبەرکردنی جلکێ لە کاتی شۆرانی ئەویتردا ‹دو تا پیراهن داشت که آنها را مرتب شورواشور می‌کرد: دوو کراسی هەبوو پەیتاپەیتا شۆراوشۆریانی دەکرد›.

**شور**[2]: *صفت.* ١. سوێر؛ سۆڵ؛ سووڵ؛ سوور؛ شۆر؛ خێرە؛ خوێواوی؛ پڕخوێ؛ نیمەنمەک ‹غذای شور؛ آب شور: چێشتی سوێر؛ ئاوی سۆڵ› ٢. بەدودم؛ بەویومن؛ قۆشە؛ نەحس؛ قۆشمە؛ تاڵ؛ جووت‌قۆشە؛ دۆبڕ؛ دوومۆڕ؛ دوومهر؛ قەشقە؛

بەدفەڕ ‹چشم شور: چاوی بەدودم› ٣. شۆڕ؛ گەوزاو لە ناو ئاوخوێدا (وەک خەیار، کەلەم، گەزەر و...) یان خوێکراو (وەک ماسی) بۆ ڕاگرتنی درێژماوە.

**شورا** / šowrā, šo:rā, šûrā ، ـها/: [عربی]/اسم. شۆرا: ١. ڕاوێژ؛ هاوبیری؛ کار یان ڕەوتی کۆبوونەوەی تاقمێک لە شوێنێ بۆ ڕاوێژکردن ‹امروز برای تأسیس شرکت شورا کردیم: ئەوڕۆ بۆ دامەزراندنی بەشدارگە راوێژمان کرد› ٢. جڤات؛ تاقمێ کە بۆ ڕاوێژکردن لە کارێکدا کۆ دەبنەوە ‹دیروز شورا داشتیم: دوێنێ جڤاتمان بوو› ٣. ڕاوێژگەری؛ ئەنجومەن؛ دامەزراوەیەک کە ئەندامانی بە مەبەستی پرس و ڕا و بڕیاردان لە سەر کارگەلێکی دیاریکراو هەڵبژێراون ‹شورای شهر؛ شورای دانش‌آموزی: شورای شار؛ راوێژگەری خوێندەواران› ٤. ڕابێژگە؛ ڕاوێژگە؛ ڕاوێژگا؛ ئەنجومەن؛ شوێنێ کە دامەزراوەی وای تێدایە ‹رفته بودم شورا: ڕۆیشتبووم بۆ رابێژگە›.

**شورائی** / šowrā'î, šo:rā'î, šûrā'î/: [عربی] ☜ **شورایی**

**شوراب** / šûrāb/: اسم. سوێراو؛ شۆراو؛ سۆڵاو؛ سۆلاڤ: ١. ئاوخوێ؛ ئاوخوا؛ مەکاوی، ئاوێ کە خوێی زۆری تێدابێ ٢. ئاوی زەریا یان زەریاچەی سوێر.

**شوراندن** / šûrāndan/: مصدر متعدی. // **شوراندی**: هورووژاندت؛ **می‌شورانی**: دەهورووژێنی؛ **بشوران**: بهورووژێنە // ١. هورووژاندن؛ وروژاندن؛ هەڵزرینگاندن؛ هەڵخراندن؛ هێژاندن؛ ڕاپەڕاندن؛ بزواندن؛ دنەدان؛ شڵەژاندن؛ دیونەی؛ دیونای؛ هۆرنیەی؛ دنەدانی خەڵک بۆ شۆڕش ٢. شێواندن؛ شەفراندن؛ پەرێشان کردن * **شورانیدن**. هەروەها: **شوراندنی**

■ صفت‌فاعلی: **شوراننده** (هورووژێنەر)/ صفت مفعولی: **شورانده** (هورووژێنراو)/ مصدر منفی: **نشوراندن** (نەهورووژاندن)

**شورانگیز** / šûrangîz/: صفت. بزوێنەر؛ وروژا؛ هۆی وروژان، شۆڕ و شایی ‹احساس شورانگیز: هەستی بزوینەر›.

**شورانیدن** / šûrānîdan/ ☜ **شوراندن**

**شورایی** / šowrāyî, šo:rāyî, šûrāyî/: [عربی] صفت. ڕاوێژی؛ شۆرایی؛ شوورایی؛ بە هاوبیری ‹نظام شورایی: سیستەمی راوێژی›: **شورائی**

**شوربا** / šûrbā/: اسم. شۆربا؛ شۆرباو؛ شۆرباوی؛ شۆڕوا؛ شۆپاو؛ ڕۆق؛ زەلکە؛ گەرمە؛ چێشتێکی تراو کە بە برنج و سەوزی لێدەنرێ.

**شوربخت** / šûrbaxt ، ـها؛ ـان/: صفت. [مجازی، ادبی] بێ‌ناوچاو؛ ڕۆژڕەش؛ بەوبەخت؛ چارەڕەش. هەروەها: **شوربختی**

**شوربرو** / šûrboro/: صفت. ئاوچۆ؛ بە تایبەتمەندی تەنگ و ترووسک بوونەوە بە هۆی شت و شۆرەوە (بۆ پارچە): **آب‌برو**

**شورت** / šort ، ـها/: [از انگلیسی]/اسم. شۆرت؛ شورت؛ شۆرتێ؛ تونکە؛ بەرگێ بۆ داپۆشاندنی خوارەوەی ناوک زۆر جار هەتا ئەژنۆ.

**شورچشم** / šûrčešm/: صفت. [مجازی] چاوپیس؛ چاوچڵە؛ چاقینۆک؛ چافکەر؛ چاوخراو؛ چاوچەپەڵ؛ چاوسووتک؛ چاوسۆتک؛ خاوەن ڕوانینێ کە بەدفەڕی و خراپی لێ‌بکەوێتەوە ‹مردک چشم‌شور بود و دخترمان را چشم زد: کابرا چاوپیس بوو، چاوی دا لە کچەکەمان›. هەروەها: **شورچشمی**

**شورش** / šûreš ، ـها/: اسم. ١. سەربزێوی؛ سەرزەیە؛ گاشە؛ سەرکەشی؛ کار و ڕەوتی سەربادان؛ ملپێچی کردن لە فەرمانی مەقامی سەرتر ٢. شۆڕش؛ کار و ڕەوتی ڕاپەڕین؛ بەرخۆدان؛ هەستانەوە؛ وەستانەوە؛ بەرهەڵستی توند و تیژانەی تاقمێک لە بەرامبەر مەقامە دەوڵەتیەکانەوە.

⊡ **شورش کردن**: ڕاپەڕین؛ سەرهەڵدان؛ سەر

هەڵـێنان؛ سـەر بەرزکردنـەوە؛ سـەر بـڵند کردنەوە؛ سەر بزواندن؛ سەربزێوی‌کردن ‹مردم شـهر شـورش کردنـد: خەڵـکی شـار ڕاپـەرین›: **شوریدن**

**شورشگر** / šûrešgar ، ـها؛ ـان/: *صفت*. سـەربزێو؛ یاخی؛ ڕاپەڕیو دژی دەوڵەت.

**شورشـی** / šûrešî ، ـهـا؛ ـان/: *صـفت*. یـاخی؛ ڕاپەڕیو؛ شیوارە؛ سەربزێو؛ هاوبەش لـە شۆڕشـی دژی دەوڵـەت ‹سـربازان شورشـی بـه پادگانهایـشان بازگـشتند: سـەربازە یاخیـەکان گەڕانـەوە بـۆ سەربازخانەکانیان›.

**شورگز** / šûrgaz ، ـها/: *اسم*. دارگـەز؛ دارگـەزم؛ دارێکی گەرمیانی لە تیرەی گەز بـە کۆتـەرەی ڕاست، چێوی ڕەق و کەو، کـە بـۆ ڕاگیرکـردنی ڕەمڵ و چەوی ڕەوان لە ناوچـە وشـکاروەکانـدا دەیکێڵن.

**شـورنرو** / šûrnaro/: *صـفت*. ئاونـەچۆ؛ بـە تایبەتمەندی نەچوونە ئاو لە شۆردندا (بۆ پارچە): **آب‌نرو**

**شورو** / ševro/: [فرانسوی]/*اسم*. مێـشن؛ تیمـاج؛ شیبرەو؛ پێستی بزن و مەڕی لە دەباغ دراو کـە سفت و پتەوە و بـۆ چـێ‌کـرنی کیـف، کـەوش، کەمەربەند و... بەکار دەچێ: **شبرو**

**شورواشور** / šûrvāšûr/ ☜ **شور**[1]

**شور و شر** / šûr-o-šar ، ـها/: [فارسی/ عربـی] ☜ **شر و شور**

**شـوروی** / šo:ravî, šûravî/: [عربـی] *صـفت*. شۆرایی؛ ڕاوێژی؛ خاوەن نیزامێکی دامـەزراو لـە سەر هاوبیری و ڕاوێژکاریەوە.

**شوره** / šûre/: *اسم*. *[شیمی]* ١. نیتراتی سروشتی پتاسیۆم کە ماکێکی سپی و بریتیە لە پتاسیۆم، نیتـرۆژن و ئوکـسیژن کـە لـە شووشەسـازی، بارووت‌سازی و کشت‌وکاڵدا بە ناوی کـووت بـە کار دەڕوا: **شورەی قلمی** ٢. شۆرە؛ کرێش؛ کرێژ؛ قرێش؛ قرێژ؛ نەمەس؛ کفگە؛ کەڤشـک؛ کەلەتۆر؛ ڕژە؛ سـرک؛ کـەن؛ کهـەن؛ سـۆ؛ کووشـک؛ کاویشک؛ وردکە پێستی نێو مووی سەر.

▣ **شورەی قلمی** ☜ **شوره**

▣ **شوره زدن**: شـۆرەدان؛ شـۆرە لێـدان: ١. بـە جـێ مانـەوەی شـوێنی خوێگـەلی تـراوە لـە تراوێکدا لە سەر شتێک، پاش بوونـە هەڵـمی ئاوەکـەی ‹دیوارهـا شـوره زده بـود: دیوارەکـان شۆرەیان دابوو› ٢. کرێژ لێدان؛ کرێش لێـدان؛ کاژەڕیزە کردنی پێستی سـەر ‹سـرت را خـوب نشستی شوره زده: سەرت باش نەشۆردووە شـۆرەی داوە›.

**شـورەزار** / šûrezār ، ـهـا/: *اسـم*. سـێلەک؛ شۆرەکات؛ شۆراخ؛ شامات؛ شـۆرەزار؛ شـۆرەک: ١. زەوینی شـۆرەدار ٢. زەوینـێ کـە بـە هـۆی خوێی زۆرەوە ڕووەکی تێدا ناڕوێت.

**شورەسازی** / šûresāzî/ ☜ **نیترایش-١**

**شوری** / šûrî/: *اسم*. سـوێری؛ سۆڵی؛ سووڵـی؛ شۆری: ١. تێرخوێیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سـۆڵ بوون ‹از شدت شوری نمی‌شود خورد: لە تـاو سـوێری ناخورێ› ٢. یەکێ لە چوار چێژی سەرەکی کـە بە پرزەکانی سـەر زوان هەسـت دەکـرێ (وەک چێژی خوێ).

**شـوریدگی** / šûrîdegî ، ـهـا/: *اسـم*. ١. پەشۆکاوی؛ شـێواوی؛ شـپرێوی؛ پەرێـشانی؛ دۆخ یان چۆنیەتی پەشـۆکاو بـوون ٢. *[مجازی]* لێوەیی؛ لێویاگی؛ شێتی؛ هەردەیی.

**شـوریدن** / šûrîdan/: *مصدر. لازم.* // **شـوریدی**: ڕاپەڕیت؛ **می‌شوری**: ڕادەپەڕی؛ **بشور** (شـورش کـن): ڕاپەڕە// ١. ڕاپەڕین؛ سەر هەڵـێنان؛ سـەر بـەرز کردنەوە؛ سەر بڵند کردنەوە؛ شلپین؛ سەربزێوی و سـەربادان لـە هەمبـەر فـەرمانی سـەرتر و حاڵەتی بەرخۆدان بـە خـۆ گـرتن ٢. ڕاپـەرین؛ شـۆران؛ بـەرخوەدان؛ بـەر خـۆ دان؛ ڕابـوون؛ هەستانەوە؛ وەستانەوە؛ سەرهەڵدان؛ بە گەل لـە بەرانبەر دەسەڵاتدارانەوە بەرەنگار بوونـەوە یـان

هێرش کردنە سەریان ✱ **شورش کردن** ٣. *[قدیمی]* شڵەژان؛ شەمزان؛ شپرزە بوون؛ شێوان؛ هەڵزرنگان؛ هەڵزرنگیان؛ شێویەی؛ شەمزین؛ پەشۆکان؛ پشۆکان؛ پەشۆکیەی؛ پەرێشان بوون؛ تێکچوون.

■ صفت مفعولی: **شوریده** (ڕاپەڕیو)/ مصدر منفی: **نشوریدن** (ڕانەپەڕین)

**شوریده**[1] / šûrîde ، ـها:/اسم. شووریدە؛ جۆرە ماسیەکی خۆشخۆراکی ئاوی شۆرە: **ماهی شوریده**

**شوریده**[2]: *صفت.[ادبی]* شێواو؛ پەشێو؛ شێویاگ: ١. شڵەژاو؛ پەرێشان؛ ئاڵۆز ‹زلف شوریده: زوڵفی شێواو› ٢. نەسرەوتە؛ هەدانەدەر؛ نائارام ‹دل شوریده: دڵی شێواو›.

**شوریدەبخت** / šûrîdebaxt ، ـها؛ ـان/: *صفت. [مجازی]* کلۆڵ؛ کرۆڵ؛ بەوبەخت؛ بەدبەخت؛ قەرەبەخت؛ چارەڕەش؛ بەرگەشتە؛ ڕۆژڕەش؛ قەشقە؛ بۆنەهاتوو؛ بۆنەهاتگ؛ بێوڵەت؛ بارکەوتوو.

**شوریدەحال** / šûrîdehāl/: [فارسی/ عربی] *صفت. [مجازی]* پەرێشان؛ پەشێو؛ شێواو.

**شوریدەخاطر** / šûrîdexāter/: [فارسی/ عربی] *صفت.[مجازی]* پەشۆکاو؛ پەشێو؛ بیربلاو؛ بیرئاڵۆز؛ تووشی پەرێشانی زەینی بە هۆی خەم و پەژارەوە.

**شوسه** / šûse/: [فرانسوی] ☜ جاده شوسه، **جاده**

**شوشکه** / šûške, šûšge ، ـها/: [روسی]/اسم. *[قدیمی]* جۆرێک شمشێری کورت کە لە ڕابردوودا ئەفسەران دەیانبەست.

**شوشه** / šûše/:/اسم. ١. کەستەک؛ شڤژ؛ شیش؛ شمش ٢. ئاوێزە؛ بیچمێکی هەندەسی.

**شوفاژ** / šofāj, šûfāj ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. شووفاژ؛ شۆفاژ: ١. دەزگای گەرمای ناوەندی کە بریتیە لە موتوری گەرمکەری ئاو و دیگ یان خەزێنەی ئاوی گەرم و ڕایەڵێ لە لوولە و ڕادیاتۆر، بۆ گەرمکردنی خانووبەرە یان کۆمەڵێک لە خانوبەرەگەل: **شوفاژ سانترال؛ حرارت مرکزی** ٢. *[گفتاری]* هەر یەکە لە ڕادیاتۆرگەلی ئەو دەزگایە ‹دستت را بگذار روی شوفاژ ببین داغ است: دەست بنە سەر شووفاژەکە بزانە داخە›.

**شوفاژخانه** / šofājxāne, šûfāj- ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. شووفاژخانە؛ هۆدە یان بینایەک کە دەزگای گەرمای ناوەندی تێدا کار نراوە.

**شوفاژسانترال** / šofājsāntrāl, šûfāj-/: [فرانسوی] ☜ **شوفاژ-١**

**شوفاژکار** / šofājkār, šûfāj- ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. شووفاژکار؛ کەسێ کە کاری دامەزراندن، درووس‌کردنەوە یان وە ڕێ خستنی شووفاژە.

**شوفر** / šofor, šûfer ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی]/اسم. ئاژۆ؛ ئاژوان؛ ئاژوەر؛ شۆفێر؛ شۆفیر؛ لێخوڕ؛ ڕانبار؛ ڕانندە؛ سەیاق.

**شوفری** / šoforî, šûferî/: [فرانسوی]/اسم. ئاژوەری؛ شۆفێری؛ شۆفیری؛ ڕانباری؛ ڕانندەیی؛ کاری لێخوڕین/ ئاژۆتن.

**شوق** / šowq, šo:q/: [عربی]/اسم. ١. تامەزرۆیی؛ شەوق؛ ئۆگرەتی زۆر بە کارێک و شوێنگیر بوونی ‹خیلی به درس خواندن شوق داشت: گەلەک تامەزرۆیی بۆ دەرس خوێندن هەبوو› ٢. هیوا؛ ئاوات؛ ئارەزوو؛ هەوا ‹به شوق دیدن تو آمدیم: بە هیوای دیتنی تۆ هاتین›.

▣ **شوق داشتن**: ١. هۆگر بوون؛ شەوقن بیەی ٢. تامەزرۆ بوون؛ ئاواتەخواز بوون؛ ئارەزوومەن/ ئاواتەواز بیەی.

**به شوق آمدن/ سر شوق آمدن**: هاتنە سەر شەوق؛ هاتنە سەر حەز و تامەزرۆیی بۆ جێبەجێ کردنی کارێک؛ دڵگەرم بوون بە کارێک. هەروەها: **به شوق آوردن/ سر شوق آوردن**

**شوق و ذوق** /šowq-o-zowq, šo:q-o-zowq/: [عربی]/اسم. دڵوداوێن؛ تام و تامەزرۆیی؛ حەز و شۆق؛ تامەزرۆیی و ئۆگرەتی هاوڕێ لەگەڵ خۆشحاڵیدا ‹نمی‌دانی با چه شوق و ذوقی کار می‌کرد: نازانی بە چە دڵداوێنێکەوە کاری دەکرد›.

**شوک** /šok، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [پزشکی] شوک؛ شۆک؛ ڕاتڵەکان؛ ڕاتەکان؛ شێوانی گەڕیانی خوێن بە هۆی گەزن یان نەخۆشینێکی ئاستەمەوە کە زۆرتر بەهۆی دابەزینی بارستایی خوێنەوە بەدی‌دێ و دابەزینی گوشاری خوێن، دڵەکوتە، ڕەنگ پەڕیوی، بێئۆقرەیی، تینوویەتی و پێستی سارد و چەسپن لە نیشانەکانیەتی: **شُک**

▣ **شوک الکتریکی/برقی:** ڕاچڵەکانی کارەبایی؛ شۆکی بەهۆی لێکەوتنی کارەباوە، چ بە ناویستی و ڕێکەوت، یان بە دەزگایەکی تایبەتی بۆ دەرمانی هێندێک لە نەخۆشیگەلی ڕەوانی، یان بۆ وەکار خستنەوەی دڵی ڕاوەستاو.

▣ **شوک دادن:** شۆک لێدان؛ شۆک پێدان؛ پێکهێنانی شۆک لە لەشی گیانداردا ‹قلبش ایستاده بود، مجبور شدند به او شوک بدهند: دڵی لە لێدان کەوتبوو، ناچار بوون شۆکی پێدەن›.

**شوک وارد شدن:** شۆک لێدران؛ شۆک پێدران؛ شۆکیایوە؛ پێکهاتنی دۆخی شۆک لە گیانداران. هەروەها: **شوک وارد کردن**

**شوکا** /šûkā، ـها/: /اسم. شووکا: ١. گەوەزنە گرگنە؛ جۆرێک گەوەزنی پچووکی کوڵۆک سپی و دوو درێژە کە هەر نێرەکانیان شاخی هەیە و بە شەش تا هەشت لق و بڕێ جار زۆرتریشەوە دەبینرێ ٢. شەمکۆر؛ جۆرێ ئاسکی یەکساڵەیە لە بزنەکێوی دەچێ و دووشاخی کلۆری چەماوەی هەیە ٣. فیلەگێجە؛ فیلەگێژە؛ گوێزەن؛ شوور؛ شووڵ؛ ئاوڕ؛ مارخۆر؛ جۆرێ کەڵەکێوی بە کلکی کورت و دوو شاخی سێ‌پەل و ڕەنگی خۆڵەمێشیەوە.

**شوکت** /šowkat, šo:kat/: [عربی]/اسم. [ادبی] شکۆ؛ هنگ‌وونگ؛ هێزی وێڕای ڕێز و گەورەیی.

**شوکران** /šowkarān, šo:karān، ـها/: /اسم. شەوکەران؛ دووڕەست؛ زڕگێژنۆک؛ مارەکوشە: ١. ڕووەکێکە لە تیرەی گێزەر، گوڵەکەی لە شێوەی چەتردایە، سپیە و قەدەکەی سەوزە، پنکە-پنکەی سووری تێدایە، توێکڵەکەی بۆ دەماخ‌کردن بە کار دێ. بۆنێکی پیس وەک بۆنی مشکی لێ‌دێ. ماکێکی ژەهری سڕکەری لێ دەردەهێنرێت بە ناو «کونین» یا «کونوسین» جاران دەرخواردی تاوانباران دەدرا بۆ کوشتنیان ٢. ژەهری بەرهەمی ئەم گیایە.

**شوکولات** /šokolāt, šûkûlât/: [فرانسوی] ☜ **شکلات**

**شوکه** /šok(k)e/: [فرانسوی] صفت. شۆکە؛ ڕاچڵەکاو؛ داچڵەکاو؛ ڕاچەنیو؛ داتروسکاو؛ داخورپاو؛ ئەوەشۆکیا؛ تووشیاری ڕاچەنین.

**شوگون** /šogûn، ـها/: [؟]/اسم. شوگوون؛ نێوی هەر یەکە لە فەرماندەگەلی ژاپونی لە سەردەمی فئوداليدا (لە سەدەی ١٢ تا ساڵی ١٨٦٧ی زایینی) کە بە شێوەی پاوشایەتی حکوومەتیان دەکرد.

**شولا** /šowlā, šo:lā، ـها/: /اسم. کەپەنەک؛ کەپەنە؛ کەڕک؛ کەچە؛ قاپووت؛ تاتکی؛ جۆرێ فەرەنجی ئاودامانی بێ‌قۆڵ و بەرواز کە زۆرتر شوانان و کۆچەران لەبەری دەکەن.

**شوله** /šowle/: /اسم. سنێرگە؛ سەرانگۆلک؛ سەروانک؛ سەرانگویلک؛ سەرانگۆلک؛ سەرەتوێلک؛ سەرگوێلک؛ سەخوڕگە؛ سەرەنوێلک؛ سەورگە؛ سەورۆگا؛ گیفک؛ گیفلان؛ گیفەلان؛ گیفەلانک؛ گوفک؛ گووفک؛ گووفەک؛ گۆفک؛ گۆفەک؛ جێگەی ڕژاندنی شیاکە و پەیین.

**شوم** /šûm/: [از عربی] صفت. بەدودم؛ بەدورم؛ بەدفەڕ؛ بێ‌فەڕ؛ سمسک؛ شووم؛ کۆدقەلین؛

کوچکرەش؛ گوناتە؛ نەحس؛ بەهوم؛ قدۆش؛ بەش؛ جووتقۆشە؛ قەشان؛ قۆشقە؛ قۆشە؛ قۆشمە: ١. ناپیرۆز؛ نالەبار و کوڵەزەرەر ‹حادثەی شوم؛ شب شوم: ڕووداوی بەدودم؛ شەوی شووم› ٢. هۆی ئاوەها ڕووداوێک ‹عقیده داشتند جغد شوم است: بڕوایان وا بوو کە کوندەبوو بەدودمە›.

**شومن** / šowman, šo:man، ـها/: [انگلیسی]/اسم. بەزمگێڕ؛ گۆبەندگێڕ؛ پیاوێ کە کاری بەزمگێڕی بێ ‹آزاد شومن شده بود و شو اجرا می‌کرد: ئازاد ببووە بەزمگێر و بەزمی دەگەڕاند›.

**شومی** / šûmî/: [از عربی]/اسم. بەدودمی؛ قۆشمەیی؛ شوومی؛ بەدفەڕی؛ بێفەڕی؛ گوناتەیی؛ بەشی؛ هومی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەدودم بوون ‹شومی این کار دامن همه را می‌گیرد: بەدودمی ئەم کارە داوێنی گشت دەگریتەوە›.

**شومیز** / šomîz/: [فرانسوی] ☜ **شُمیز**

**شومینه** / šomîne/: [فرانسوی] ☜ **شُمینه**

**شونیز** / šonîz/ ☜ **سیاهدانه**

**شوونیست** / šovînîst, šovonîst، ـها/: [فرانسوی] صفت. شوڤینیست؛ زێدپەرست.

**شوونیستی** / šovînîstî, šovonîstî/: [فرانسوی] صفت. شوڤینیستی؛ زێدپەرستی؛ پێوەندیدار یان سەر بە شووڤینیزمەوە ‹گرایشهای شوونیستی: ئۆگرەتیە شوڤینیستیەکان›.

**شوونیسم** / šovînîsm, šovonîsm/: [فرانسوی] اسم. شوڤینیزم؛ شوڤینیسم؛ نەتەوەپەرستی لەڕادەبەدەر و دوور لە ئاوەز.

**شوهر** / šowhar, šo:har، ـها؛ ـان/: اسم. شوو؛ شووی؛ شی؛ مێرد؛ مێر؛ مێردە؛ مێرە؛ مێردلە؛ مەرن؛ هاوسەری ژن؛ پیاوێ کە لەگەڵ ژنێکدا زەماوەندی کردبێ.

▣ **شوهر دادن**: دانە شوو: ١. بە مێرد دان؛ بە شوودان؛ دای شوو؛ شوو دەی؛ کچ یان ژنێک مارەکردن بۆ پیاوێک ‹پارسال دختر بزرگش را شوهر داد: پارەکە کچە گەورەکەی دا بە شوو› ٢. /مجازی/ بە فێڕۆدان؛ لە کیس دان؛ فەوتاندن؛ لە دەست دان؛ فوو دەی؛ مفت شتێک لە دەست دان ‹قالی بە آن خوشگلی را شوهر دادی، رفت؟!: قاڵی بەو جوانیەت دایە شوو، چوو؟!›.

**شوهر کردن**: مێردکردن؛ شووکردن؛ شووی کرن؛ شی‌کردن.

**شوهرخاله** / šowharxāle, šo:harxāle/: [فارسی/ عربی]/اسم. شووی پوور؛ شووی میمک؛ شوو مەتێ. هەروەها: **شوهرخواهر؛ شوهرعمه**

**شوهردار** / šowhardār, šo:har-/: صفت. شوودار؛ شوودارە؛ مێرددار؛ بە مێر؛ ژنی شوودار.

**شوهرداری** / šowhardārî, šo:har-/: اسم. ١. شووداری؛ لێوەشاوەیی و لێهاتوویی بۆ بەخێو کردنی شوو ‹کمی هم به دخترت شوهرداری یاد بده!: نەختێکیش شووداری فێری کچەکەت کە!› ٢. کەیوانوویی؛ بنەوانی.

**شوهرننه** / šowharnane, šo:har-/: اسم. /گفتاری/ باوەپیارە؛ زڕەباب؛ زڕباب؛ بابهەلک؛ پیاوێ جگە لە بابی کەسێک، کە دەگەڵ دایکیدا زەماوەنی کردبێ.

**شوهریابی** / šowharyābî, šo:har-/: اسم. کار یان ڕەوتی کردوکۆش بۆ دۆزینەوەی پیاوێکی لەبار بۆ زەماوەند دەگەڵ ژنێکدا؛ مێردنانەوە؛ شوو نانەوە.

**شوی**[1] / šûy، ـها/: اسم. /ادبی/ شوو؛ مێرد: **شو**

**ـ شوی**[2]: پیوازه. ـ شۆر؛ بشۆر ‹رختشوی: جلشۆر›.

**ـ شویان** / šûyān/: پیوازه. ـ شۆران: ١. کار یان ڕەوتی شۆردن ‹مراسم قالی‌شویان: ڕێوڕەسمی قاڵیشۆران› ٢. کەسانێ کە کاریان شۆردن بێت ‹قالی‌شویان: قاڵیشۆران›.

**شوید** / šivîd, ševîd/ ☜ **شِبِت**

**شویدی** / šivîdî, ševîdî، ـها/: اسم. گیایەکی ڕازێنەیی بە لق و پۆی درێژی چەماوە و گەڵای

زۆری ورد وەک گەلای شویتەوە.

**شوینده** / šûyande ، ـها/:اسم. پێشۆر؛ هەر یەکە لەو ماکە خاوێنکەرانە (وەکوو سابوون، تراوی دەفر شۆردن و...) کە بۆ شۆردن و خاوێن کردنەوە بە کار دێن.

**ـ شویی** / šûyî/: پیوازه. ــ شۆری ‹خاکشویی؛ لباسشویی: خاکشۆری؛ جلشۆری›: **شوئی**

**شه** / šah ، ـان/:اسم. [مخفف، ادبی] شا؛ پاوشا؛ پادشا؛ پاڵشا.

**شهاب** / šahāb, šehāb ، ـها/: [عربی]/اسم. شۆڵە؛ تیرئەستێرە؛ ئەستێرەی کشاو؛ بەردێکی چکۆلەی ئاسمانیە کە بە هۆی پەڕینەوە لە کەشی زەوین هەڵدەبێ و وەک گزینگێک بە ئاسمانەوە دەنوێنێ.

**شهابسنگ** /-šahāb-, šehāb ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. بەردئەستێرە؛ گێئاسارە؛ بەردی ئاسمانی بە هێندێکی کەم (تا ۲۰٪) ئاسنەوە.

**شهادت** / šahādat ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. گەڤایی؛ گەوایی؛ شایەتی؛ ستروڤی؛ کار یان ڕەوتی گوا دان؛ گەڤا دان؛ گەوا دەی/ دای؛ ستوودان؛ ستوڤەدان؛ ستووڤدان ۲. کار و ڕەوتی شەهید بوون؛ گیان بەخت کردن.

⊡ **شهادت دادن:** گوادان؛ گۆڤادان؛ ستووڤدان؛ ستوودان؛ ستووڤەدان؛ گوایی دان؛ وەکوو شایەت لە سەر ڕووداوێکی بەرباس قسەکردن ‹حاضرم در دادگاه شهادت بدهم: ئامادەم لە دادگادا گەوا بدەم›.

**به شهادت رسیدن:** شەهید بوون؛ گیان بەخت بوون؛ کوژران لە ڕێگەی ئامانجی خۆدا.

**شهادتنامه** / ,šahādatnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. ۱. گەوانامە؛ نووسراوەیێ کە گەوای دیتراوەکان لەمەڕ ڕووداوێکی دیاریکراودا دەردەبڕێ ۲. [قدیمی] بڕوانامە؛ دیپلۆم.

**شهادتین** / ,šahādateyn/: [عربی]/اسم. [اسلام] شاتیمان؛ شایەتیمان؛ شادمانە؛ شادە؛ شادەوئیمان؛ ئیمانوشادەت؛ شادەت و ئیمان؛ کار یان ڕەوتی گەوادان لە سەر تاک و تەنیا بوونی خودا و پەیامهێنەری حەزرەتی موحەممەد بە وتنەوەی ئەم ڕستانە: «أشهد أنَّ لا إله إلا الله، أشهد أنَّ محمداً رسول الله».

**شهامت** / šahāmat ، ـها/: [عربی]/اسم. ئازایەتی؛ بوێری؛ گوربزە؛ جەربەزە؛ غیرەت؛ دۆخ یا چۆنیەتی نەترسان ‹اگر شهامت گفتنش را نداری، بگذار من بگویم: ئەگەر ئازایەتی وتنیت نیە، بهێڵە من بیڵێم›.

**شهباز** / šahbāz ، ـها/:اسم. شاباز؛ باڵندەیەکی ڕاوکەرە لە تیرەی باز، بە چاوگەلێکی زەرد و چڕنۆک و دندووکی بە هێزەوە کە نزم دەفڕێ و مێوینەکانیان گەورەترە: **شاهباز؛ ترلان؛ طَرلان**

**شهبانو** / šahbānû ، ـها/:اسم. شاژن؛ شابانوو؛ سەرەژەنی؛ سەرەژن؛ قەڕاڵیچە؛ هاوسەری شا.

**شهپر** / šahpar ، ـها/:اسم. شاباڵ؛ شاپەڕ؛ شاباڵی مەل.

**شهد** / šahd/: [عربی]/اسم. شیلە: ۱. شیرە؛ تراوێکی شەکراویە کە لە هێندێ گیاوە هەڵدەچۆڕێ و دەبێتە هۆی ڕاکێشانی میروو یان پەلەوەران و لە ئاکامدا گەردە پژێنی ۲. دۆشاو؛ شیرە؛ گووشراوەی میوە، بەتایبەت خەست ‹شهد انگور: دۆشاوی ترێ› ۳. [مجازی] هەنگوین؛ هەنگوێن؛ هەنگڤین؛ هەنگڤێ؛ ڕنگاڵ ٤. ڕەواق؛ شەربەتێ کە بە هۆی زۆر کوڵانەوە، خەست بۆتەوە ‹شهد مربا: ڕەواقی مرەبا›.

**شهدا** / šohadā/: [عربی] جمعِ ☜ **شهید**

**شهر** / šahr ، ـها/:اسم. شار: ۱. بازێڕ؛ شەهر؛ بازاڕ؛ شارسان؛ شارستان؛ شارستێن؛ ژینەوارێکی گەورە، بە خانوبەرە و دانیشتوانی زۆرەوە (زۆرتر لە ۵۰۰۰ کەس) و هەروەها دامەزراوە و ڕێخراوەگەلی ئاسوودەیی و کارگێڕیەوە ۲. [مجازی] خەڵکێ کە تێیدا دەژین ‹با این کارها شهر را بر علیه خود شوراند: بەم کارانە شاری لە خۆی

هورووژاند›.

◙ **شهر بازی**: شاری یاری؛ کایەکۆ؛ شاری کایە؛ شوێنێک بە دامەزراوە و ئامرازی پێویست بۆ گەمە و ڕابواردن، بەتایبەت بۆ منداڵان.

**شهر هرت**:/مجازی/ شاری هەرکی ــ هەرکی؛ شاری هەرکە بۆ خۆی؛ شاری بێقانوون و بێ سەرە و بەرە.

**شهرآشوب**[1] / šahrāšûb/:/اسم. شەهرئاشووپ: ١. /موسیقی/ نێوی بەزمێک لە مووسیقای ئێرانیدا ٢. ناوی جۆرێک شیعرە سەبارەت بە پیشەوەران و پیشەگەلی جۆراوجۆر.

**شهرآشوب**[2]:/ادبی/ شارشێوێن؛ شارانشێو؛ شێوەژنە؛ پشیلەنەوتینە؛ کتکەنەفتینە.

**شهربانی** / šahr(e)bānî ، ـها/:/اسم. شارەوانی؛ ڕێکخراوەیەکی چەکداری بۆ پاراستنی قانوون و هێمنی شاران.

**شهربندان** / šahrbandān ، ـها/:/اسم. گەمارۆی شار؛ کاری دەورە دانی شار بۆ داگیرکردنی.

**شهرت** / šohrat ، ـها/: [عربی]/اسم. ناوبانگ؛ شۆرەت: ١. دەنگوناو؛ نێوبانگ؛ ناقدەنگ؛ ئاوازە؛ دەنگان؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەناوبانگ بوون ٢. فامیلی؛ ناوی بنەماڵەیی.

◙ **شهرت دادن**:/گفتاری/ دەنگودۆ داخستن؛ قیل و قاڵ داخستن؛ قاو داخستن؛ بڵاو کردنەوە؛ دەنگۆ داخستن ‹در شهر شهرت دادند که قرار است کودتا بشود: لە شار دەنگ و دویان داخست کە بڕیارە کوودەتا بێ›.

**شهرت داشتن**: ناو دەرکردن؛ بەناوبانگ بوون؛ ناسیاو بوون؛ ناوبانگ دەرکردن؛ نامدار بیەی؛ ناو داخستن ‹به درستکاری و مردمداری شهرت داشت: بە درووسکاری و خەڵک دۆستی ناوی دەرکردبوو›. هەروەها: **شهرت یافتن**

**شهرت پرست** / šohratparast/: [عربی/ فارسی]

☜ **شهرت‌طلب**

**شهرت‌طلب** / šohrat.talab ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. ئاوازەخواز؛ خوازیاری ناودار بوون. هەروەها: **شهرت‌پرستی؛ شهرت‌طلبی**

**شهردار** / šahrdār ، ـها؛ ـان/:/اسم. شارەدار؛ شاردار؛ باژێرڤان: ١. بەڕێوەبەری مەزرینگەی شارەداری ‹شهردار کرمانشاه: شارەداری کرماشان› ٢. /مجازی/ ئەندامێ لە کۆمەڵێک (بنەماڵە، خوێندکارانی نووستنگەیەک، بەندکراوانی سلوولێ) کە بە هەڵبژاردن یان نۆرەیی خزمەتەگشتیەکان وەئەستۆ دەگرێ.

**شهرداری** / šahrdārî ، ـها/:/اسم. شارەداری؛ باژێرڤانی؛ ڕێکخراوەیێ کە وەئەستۆگری خزمەتەکانی نێو شار بێ (وەک درووس کردن و پاراستنی شەقامەکان و پارکەکان و خاوێن کردنەوەی شار و ...).

**شهرسازی** / šahrsāzî ، ـها/:/اسم. شارسازی؛ کار یان ڕەوتی شار درووس کردن.

**شهرستان** / šahrestān ، ـها/:/اسم. شار؛ باژێر؛ شارستان، بەشێک لە پارێزگا، بە ئاسایی بریتیە لە یەک یان چەن شار و شارۆچکە و دێهاتی بە ئاقاریەوە.

**شهرستانی** / šahrestānî ، ـها/: صفت. باژێری؛ شارستانی؛ پێوەندیدار یان سەر بە شارەوە ‹لهجەی شهرستانی: زاراوەی شارستانی›.

**شهرفرنگ** / šahrefarang ، ـها/: [فارسی/ از فرانسوی]/اسم. دەزگای پیشاندانی نومایش لە کۆندا بە شێوەی ئۆدەیەکی بچووکی گواستنی کە تماشاچیەکان دەیانتوانی بە چاو پێوەنان لە ڕۆچنەکانی سەیری بکەن.

**شهرک** / šahrak ، ـها/:/اسم. ١. شارۆچکە؛ شارۆکە؛ باژێر ٢. شارەک؛ کۆمەلە خانوویەک بە دامەزراوەگەلی شاریەوە (وەک: ئاو، کارەبا، تەلەفوون؛ شەقام، و فرۆشگە و...) بەلام گچکەتر لە شار و لە بواری مەزرینگەییەوە بەشێک لە شار.

**شهرنشین** / šahrnešîn ، ـها؛ ـان/: صفت.

شارنشین؛ باژێری؛ شاری؛ دانیشتووی شار. هەروەها: **شهرنشینی**

**شهروند** / šahrvand ، ـها؛ ـان/: /اسم. شاروەر؛ شارۆمەند؛ شارستانی؛ شارسانی؛ شاری؛ کەسێ کە بە خەڵکی شار یان وڵاتێک دێتە ژمار و لە مافی وێدا بەشدارە. هەروەها: **شهروندی**

**شهره** / šahre/ ☜ **شهله**

**شهره** / šohre/: [عربی] صفت. [ادبی] بەناوبانگ؛ ناودار؛ ناسراو؛ ناوبەدەر ‹بە آزادگی و مردمداری شهره بود: بە ئازادەیی و مرۆڤدۆستی بەناوبانگ بوو›.

**شهری** / šahrî ، ـها؛ ـان/: صفت. شاری؛ باژێری؛ پێوەندیدار یان سەر بە شارەوە ‹جوان شهری: لاوی شاری›.

**شهریار** / šahriyār ، ـها؛ ـان/: /اسم. [ادبی] شاریار؛ شالیار؛ شاڵیار؛ شا؛ پاوشا؛ پاشا؛ پادشا.

**شهریاری** / šahriyārî/: /اسم. [ادبی] شاریاری؛ شالیاری؛ پاشایی؛ شایی؛ پادشایی؛ پاوشایی؛ پاڵشایی.

**شهریت** / šahrîyyat/: (!) [فارسی/ عربی] /اسم. شارستانیەتی؛ شارسانیەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شار بوون و هەبوونی تایبەتمەندیگەلی شار ‹آن روزها قروه اسمش شهر بود ولی شهریت نداشت: ئەو ڕۆژانە قوروە ناوی شار بوو بەڵام شارستانیەتی نەبوو›.

**شهریور** / šahrîvar/: /اسم. خەرمانان؛ مشتاخان؛ شاریوەر؛ ئاخر مانگی هاوین؛ مانگی شەشەمی ساڵی هەتاوی ئێرانی کە ۳۱ ڕۆژە.

**شهریه** / šahrîyye ، ـها/: [عربی] /اسم. مانگانە؛ نرخی کەڵک وەرگرتن لە خزمەتگەلی دامەزراوەیەک بۆ مانگێک (یا خۆ بۆ ماوەیەک، ترمێک، ساڵێک، ...).

**شهسوار** / šahsavār ، ـها؛ ـان/: /اسم. [قدیمی] شاسوار؛ سوارخاس؛ سوارچاک؛ شۆڕەسوار؛ کەڵەسوار: ۱. سواری جەنگی؛ سواری جەنگاوەر ۲. شوالیە.

**شهلا** / šahlā/: [عربی] صفت. ۱. چاوباز؛ کەژاڵ؛ چاوێ کە درشت و جوان بێ ۲. کاڵ (بۆ چاو).

**شهله** / šahle/: [؟] /اسم. توێژەبەزی چەوری لە سەر گۆشتی سوور (بێجگە لە دووگ): **شهره**

**شهله وشهید** / šahle-vo-šahîd/: [؟/ عربی] صفت. [گفتاری] شەلوپەت؛ شەلوکوت؛ لەتوپەت؛ لە کارکەوتوو بە هۆی شەکەتی یان زیان دیتنەوە.

**شهناز** / šahnāz/: /اسم. شەهناز؛ لە هەواکانی مووسیقای ئێرانی؛ گۆشەیەک لە دەزگای شوور.

**شهوات** / šahavāt/: [عربی] جمعِ ☜ **شهوت**

**شهوانی** / šah(a)vānî/: [عربی] صفت. ئاڵۆشی؛ گانەک (بۆ پیاو)؛ گانەکی/ زەنەک (بۆ ژن) پێوەندیدار یان سەر بە خواستی جنسیەوە.

**شهوت** / šahvat ، ـها؛ شهوات/: [عربی] /اسم. ئاڵۆش؛ هاش؛ ئارەزوو/ حەز/ مەیل و خواستی زۆر، بەتایبەت جنسی.

◙ **شهوت کلام**: زۆروێژی؛ فرەبێژی؛ حەز بە قسەی زۆر کردن.

**شهوت‌انگیز** / šahvatangîz/: [عربی/ فارسی] صفت. ئاڵۆشاوی؛ هۆی هاندانی خواستی جنسی.

**شهوت‌پرست** / šahvatparast ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. ئاڵۆشن؛ ئۆگرەتی زۆر بە کردەوەی جنسی.

**شهوتران** / šahvatrān/: [عربی/ فارسی] صفت. بە ئاڵۆش؛ زەنەک (بۆ پیاو)؛ حەشەری (بۆ ژن)؛ ئەلۆر؛ شاوەتی؛ بە حەز و کردەوەی جنسی زۆرەوە. هەروەها: **شهوترانی**

**شهود** / šuhûd, šohûd/: [عربی] /اسم. ۱. جمعِ ☜ **شاهد** ۲. ئاگەداری ڕاستەوخۆ و بێ‌ناونج.

**شهودی** / šuhûdî, šohûdî/: [عربی] صفت. دیار؛ خویا؛ خویان؛ دیتنی: ۱. بەرچاو؛ دیاردەر؛ بە تایبەتمەندی دیتران بە چاو ۲. گونجاو بۆ تێگەیشتنی ڕاستەوخۆ و بێ ناونج.

**شهوی** / šahavî/: [عربی] صفت. ئاڵۆشی؛ شەهوەتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە شەهوەتەوە.

**شــهید** / šahîd ، ـهـا؛ ـان؛ شـهدا/: [عربـی]/اسـم. شەهید؛ شەهیت؛ شەهی: کەسێ کـە لـە ڕێـی خەبات بۆ ئامانجەکانی دەکوژرێ.

**شهیر** / šahîr/: [عربـی] *صفت.* /ادبی/ بـەناوبانگ؛ ناودار؛ نامـدار؛ ناسـراو؛ بـەناو؛ ناسـیاگ؛ ناسـیاو ‹شاعر شهیر: شاعیری بەناوبانگ›.

**شهیق** / šahîq/: [عربی]/اسم. ۱. هەناسـە؛ کـار و ڕەوتی هەناسە دان؛ هەناسە هۆرکێـشتەی/ دای ۲. /قدیمی/ زڕە؛ زەڕە؛ سەڕە؛ دەنگی گوێدرێژ.

**شــیاد** / šayyād ، ـهـا؛ ـان/: [عربــی] صـفت. چەتلەمەر؛ دەسبڕ؛ فێـڵباز؛ تـەڵـەکەباز؛ داوبـاز؛ حەوقــەباز؛ گغــنیبــاز؛ گورگــە؛ ســاختەچی؛ قەڵبەزەن؛ قەڵبەژەن؛ گزیکار؛ خاوەن خوو یـان ئۆگرەتی بە خەڵەتانـدنی خەڵـکی بـۆ قـازانجی خۆ. هەروەها: **شیّادی**

**شیار** / šiyār ، ـها/:/اسم. درز؛ دەرز؛ شوێن؛ شـیر؛ شــووین؛ شــەقار؛ شــوێن و لەلـە؛ قـڵێش؛ گـاز؛ ترەکە؛ تلیش؛ تلیشە؛ چالگەلی باریک و درێژ و نەک زۆر قووڵ لە ڕووپەڕی شتێکدا.

⊡ **شیار زدن** ☜ **شیار کردن**

**شیار کردن:** /کنایی/ شـێف بـڕین؛ هـێڵ دانی زەوی بۆ کێلان: **شیار زدن**

**شیاردار** / šiyārdār/: صفت. شـەقاردار؛ بـەدرز؛ قلێشدار؛ درزدار.

**شــیارزنی** / šiyārzanî/:/اسـم. کـار یـان ڕەوتی شێف بڕین؛ هێڵ دان ‹اگر شیارزنی این زمین تمام بشود، می‌توانیم نشاها را بکاریم: ئەگـەر شـێف بـڕینی ئـەم زەویـە دوایــی بێــت، دەتــوانین شەتـڵەکان بکێلین›.

**شیاطین** / šayātîn/: [عربی] جمعِ ☜ **شیطان**

**شیاع** / šiyā'/: [عربی]/اسم. /ادبی/ کار یـان ڕەوتی بڵاو بوونەوە؛ دەنگۆ داکەفتن؛ قوو داکەوتن.

**شیاف** / šiyāf ، ـها/: [عربی]/اسم. شـاف؛ پووشـڵە؛ پووشەڵـە؛ دەرمـانێکی قـووچی بچـووک و پتـر ڕۆناویـە کـە بـە تـینی لـەش دەتوێتــەوە و لـە ڕیخۆڵەوە دەگاتە هەموو جەستەوە.

**شیء** / šey' ، ـها؛ اشیا/: [عربی]/اسم. شت؛ چـت؛ چشت؛ چـیش؛ چێـو؛ تیـشت؛ تـشت؛ ئەشـت؛ ئەشتەبا؛ ئاتک؛ ناهـا: ۱. بوونـەوەری بـێ گیـان، بەتایبەت ئەوەی کە بگوێزرێتـەوە ‹شئ کوچک؛ شئ قیمتـی: شتــی چکۆلـە؛ شتــی بایەخـدار› ۲. /فلسفه/ ئەوەی بزانرێ، بناسرێ و لە بارەیـەوە بڕیار بدرێ.

**شیب** / šîb ، ـها/:/اسم. نشێو؛ لێژ؛ لێژایی؛ لێژەی؛ لــەپ؛ خــوێز؛ ســەرەولێژایی؛ ســەرەولێژی؛ ســەرەوخوارکایی؛ سـەرەخوارکێ؛ سـەرەوارییێ؛ سەرەوخواری؛ داخز؛ ئەندازەی لادانی بـەرەخوار لە ئاستی ئاسۆدا ‹از شیب رودخانـه بـه طرف پـایین سرازیر شدیم: لـە نـشێوی ڕووبارەکـەوە بـەرەو خـوار هاتین›.

▣ **شیب تند:** لالێژ؛ تیژ؛ لێژی تیژ؛ خەشـیتولک؛ خەشیقولک.

**شیبدار** / šîbdār/: صفت. نشێو؛ لێژ ‹سطح شـیبدار: ڕووپەڕی لێژ›.

**شیب‌راه** / šîbrāh/:/اسم. لێژەڕێ؛ بـەشـێک لـە ڕێگا کە دوو ڕێگـەی بـان و خـوار دەگەیەنێتـە یەک و لێژ و یەکلایەنەیە: **شیب‌راهه**

**شیب‌راهه** / šîbrāhe/ ☜ **شیب‌راه**

**شــیبک** / šîbak/:/اســم. خلیــسکە؛ ڕەمــپ؛ ڕووپــەڕێکی کــانزایی لــووس و لێــژە بــۆ ساناکردنەوەی بار کـردن یـان بـار داگـرتن لـە ماشینی بارەبەر.

**شیپسی** / šiypsi/: [روسـی] /اسم. /چاپ، قـدیمی/ شیپسی؛ هەمۆرێکی بچووکی کانزایی کە پـیتی چاپی پێ هەڵدەگیرا.

**شــیپور** / šeypûr ، ـهـا/: [سـریانی]/اسـم. بۆڕیـە؛ توتوک؛ کەڕەنا؛ بۆڕی؛ شەیپوور؛ سـازێکی بـایی کانزایی، بە شێوەی لوولەیەکی درێـژ و چـەماوە کـە سـەرەکەی هـەراوە و هێنـدێک کلیـل و دوگمەی لە سەرە.

**شیپورچی** / šeypûrčî ، ـها؛ ـان/: [سریانی/ ترکی] /اسم. کەرەناچی؛ شەیپوورچی؛ بۆریەژەن؛ کەسێ کە کاری ژەندنی کەرەنایە.

▣ **شیپورچی یزید و طبال امام حسین بودن:** [تعریض] هەلخواز و خەیان بوون؛ سەگی دوولاوەر بوون؛ لەگەڵ دزا دز و لەگەڵ کارواندا سەرقافڵە بوون؛ بە کەروێشک وتن ڕاکە و بە تاژی وتن بیگرە؛ هاریکاری کردنی دوولایەنی پێشبرکێ.

**شیپوره** / šeypûre ، ـها/: [سریانی/ فارسی] /اسم. پژانە؛ پژێنەک؛ ئامرازێ یان بەشێ لە کەرەسەیەک بۆ پژاندنی تراو (وەک ئاوپژێنە)

**شیپوری**[1] / šeypûrî/: [سریانی] /اسم. شەیپووری؛ گوڵەکاردوو؛ گوڵەکاردی؛ گوڵەهاز؛ گوڵەخاز؛ گوڵێکی هەمە ڕەنگەی گەلاپانە، لە شەیپوور دەکا.

**شیپوری**[2]: صفت. شەیپووری؛ کەڕنایی؛ کەرەنایی ‹گل شیپوری؛ بوق شیپوری: گوڵی شەیپووری؛ بۆقی شەیپووری›.

**شیخ** / šeyx ، ـها؛ شیوخ؛ مشایخ/: [عربی] /اسم. شێخ؛ شەیخ؛ پیر: ١. سەرناوێک بۆ ئەو کەسانە کە مەلا یان دیندارن ٢. سەرۆکی هۆزە عەرەبیەکان.

**شیخ‌السفرا** / šeyxossofarā/: [عربی] ☜ **مُقَدّم‌السُفَرا**

**شیخک** / šeyxak ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. سۆفیلە؛ سۆفیلەک؛ دەنکە تەزبێحی جیاواز لە دەنکەکانی‌تر، کە لە هەر تەزبێحێکدا دوو دەنکی وا بە مەودایەکی یەکسان لەوانی‌تر هەیە.

**شیخ‌نشین** / šeyxnešîn ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. شێخ‌نشین؛ هەرێمی حکوومەتی شێخە عەرەبەکان.

**شیخی** / šeyxî ، ـها/: [عربی] /اسم. شێخی؛ هەر یەکە لە شوێن‌کەوتوانی دەستەی ئایینی شێخیە.

**شیخیه** / šeyxîyye/: [عربی] /اسم. شێخیە؛ تاقمێک لە موسوڵمانانی شیعەی دوازدە ئیمامی کە خۆیان بە شوێن‌کەوتووی شێخ ئەحمەدی ئیحسایی (١١٦٦-١٢٤١ کۆچی- مانگی) دەزانن.

**شیدا** / šeydā/: [آرامی] صفت. شەیدا: ١. هەوایی؛ ئاپتەر؛ گیرۆدەی ئەوینێکی شێتانە ٢. تووشیاری گیرۆدەیی ئەویندارانە (وەک: شادی، خەم، پەژارە و تووڕەیی) کە پەیتا-پەیتا بە هۆی دڵداری یان ئۆگرەتی زۆر بە کەسێ یان شتێکەوە بەدی‌دێ ٣. [روانشناسی] خولیا؛ مانیاک؛ تووشیاری شێتی ماوەیی.

**شیدائی** / šeydā'î/: [آرامی/ فارسی] ☜ **شیدایی**

**شیدایی** / šeydāyî ، ـها/: [آرامی/ فارسی] /اسم. شەیدایی؛ ئاپتەری: ١. ئەوینی شێتانە ٢. هەیەجانی وێڕای چالاکی زۆری زەینی و جەستەیی، کردەوەی شپرز و بەرزەفڕی ٣. [روانشناسی] خولیایی؛ شێتی ماوەیی * **شیدائی**

**شیر** / šîr/: /اسم. ١. شیر؛ شۆت؛ تراوێ کە لە لوی مەمکی گوانددارانی مێوینەوە بۆ بژیوی ساواکانیان دەدەڵێ ٢. /ـها؛ ـان/ شێر؛ گیانەوەری گوانداری گەورەی گۆشتخۆر و (زۆرتر) شەو ڕاو، بە پێستی گەنمی، کلکی درێژ و گوڵینگ‌دار، نێرەکەی بە یاڵی چڕی ڕەش یان قاوەیی تۆخەوە، کە لە ناوچەگەلی ئاواق یان کوێستانی (قامیشەڵان، میشەڵان، زێواری لێڕەواران) ولاتانی گەرمەسێری، بەتایبەت لە ئافریقادا دەژی ٣. [نجوم] شێر؛ ئەسەد؛ وێنەی پێنجەم لە وێنە گەردوونیەکان: **اسد** ٤. /ـها/ شێر؛ شێرە؛ شێراو؛ موسلوخ؛ بەلوغە؛ ئامرازێک بۆ بەردان و بەستنی تراوێ کە لە لوولە، دەفر یان خەزێنەییێکدایە ٥. شێر؛ ئەو دیوەی سکە کە وێنەی پێوەیە، بەرامبەری خەت ٦. [گفتاری] شیلە؛ شیر؛ شیرەی گیا و دار ٧. [مجازی] دلێر؛

ئازا؛ بوێر؛ مێرخوز؛ مێرخاس؛ عەگید؛ نەترس؛ زاتدار.

▣ **شیر آتش‌نشانی:** شێری ئاورتەمرێنی؛ شێری ئاگرکوژاندنەوە؛ شێری هەڵێنجانی ئاوی بە تەوژم بۆ کوژاندنەوەی ئاگر کە بە هەماراوی شارەوە بەندە.

**شیر استرلیزه:** شیری ئیستیرلیزە؛ شیرێ کە ماکی نەخۆشی‌هێنەری تێدا لە نێو براوە.

**شیر برفی:** *[کنایی]* پاڵەوان پەمە؛ لۆیەبەلم؛ مرۆڤی بە ڕواڵەت خۆ بەهێز دانەر و بە کردەوە ناتەواو و لێ‌نەهاتوو.

**شیر بی‌یال و دم:** *[مجازی]* ۱. فشە؛ فشەلۆک؛ کاری پووچ ۲. داربەلەک؛ دەسەلاتداری ڕواڵەتی.

**شیر پاستوریزه:** شیری پاستۆریزە؛ شیرێ کە کاری پاستۆریزاسیونی لە سەر کراوە و ماکی نەخۆشی لێ براوە.

**شیر خشک:** شیر وشک؛ شیری وشک؛ شیرێ کە ئاوەکەیان گرتووە و بە شێوەی گەرد دەریان هێناوە تا بۆ ماوەیەکی درێژ بمێنێتەوە.

**شیر خودکار:** شێری خۆمەش؛ شێرێ کە بە هۆی دۆخێکی تایبەتەوە (وەکوو زۆر بوونی بارستایی تراو لە نێو خەزێنە، یان بە شتێک گیرانی شێرەکە) باز و بەستە دەبێ.

**شیر دریایی:** شێری زەریایی؛ شێر دەریایی؛ گیانەوەرێکی بێچووزای ڕاوچیە کە لە قەراخی ئاو دەژی، مەلەوانی چاکە و ماسی ڕاو دەکا.

**شیر عسلی:** شیرـــ هەنگوین؛ شیرێ کە خەستیان کردۆتەوە و هەنگوێن یان ماکی شیرینیان لێ‌زیادکردووە.

**شیر فشاری:** شێری گوشاری؛ شێرێ کە بە قامک پێوەنانی دوگمەیەک دەکەوێتە کار.

**شیر فلکه:** شێر فەلەکە؛ شێرێک بە سەرێکی چەرخ‌ئاساوە بۆ کردنەوە و بەستنی گەڕانی تراو لە نێو ڕایەڵەیەکدا (وەک لوولەکێشی ئاوی خانووبەرە یان گازی گەڕەکێک).

**شیر کوچک:** *[نجوم]* کەلوویەکی بچووکی ئاسمانیە لە باکووری گۆی زەوی لە نێوان وێنەی ورچی گەورە و شێردا: **اسد اصغر**

**شیر کوهی:** شێری کێوی؛ هەردەشێر؛ گیاندارێکی گوانداره لە ڕیزی گۆشتخۆرەکان، لە ئەمریکا دەژی، دەنگی قیژەئاسا و ڕەنگی خورمایی تۆخ بەرەو قاوەیی و بێچووەکانی خەت یان خاڵداره: **کوگار؛ پوما**

**شیر ماک:** ژەک؛ زەک؛ ژاک؛ زاک؛ فرشک؛ فریشک؛ فرچک؛ گووش؛ خەڵپووت؛ فرەندوول؛ شیرماک؛ فله؛ شمه؛ فرشه؛ زهک؛ فری؛ فرۆ؛ خرندۆڵ؛ خەڵەندۆر؛ قاقنە؛ لیوە؛ لوی؛ زەها؛ گوچ؛ شیری زنج؛ شیری چەور و خەستی گوان/ مەمک، چەن ڕۆژ پێش یان پاش زایین.

**شیر مرغ:** *[مجازی]* ۱. شیری چۆلەکە؛ شاخی مێروولە؛ شۆتوو مریچلێ؛ شتی نایاب و نەگونجاو ۲. *[گیاەشناسی]* جافیلۆکە؛ گیاخە؛ شیری باڵندە؛ ڕووەکێکە بۆ جوانی لە باخچە و بێساندا ئەکێڵدرێ، لە تاقمی شلێرە بە گەلای درێژ و وشک، گوڵی هێشوویی سپیکەلە یان کەسک یا خۆ زەردەوە، لەم ڕووەکە سرێش بەرهەم دێ.

**شیر مَنیَزی:** شەربەتی مەنیەزی؛ هیدرۆکسیدی مەنیەزیۆم کە بە شێوەی تراوێکی شیری‌ڕەنگ بۆ کەم‌کردنەوەی ئەسیدی گەدە بە کار دێت.

▣ **شیر به شیر آوردن:** شیراوشیرکردن؛ شیر بە شیر بوون؛ سک و زا کردن لە مەوداگەلێکی کورتدا و پێش لەوەی کە منداڵی پێشوو لە شیر برابێتەوە.

**شیر خام خوردن:** *[کنایی]* ۱. لە گوێی گادا خەوتن؛ کەمتەرخەمی کردن؛ خستنە پشت

گوێچکە؛ خەی نەدان بە گوێرەی کاری پێسپێردراو ۲. خەرمانی هیوا هەر کا بوون؛ بە تەمای پڕ و پووچ بوون؛ بێخۆ بە تەما بوون.

**شیر خوردن:** ۱. شیر خواردنەوە؛ شیر خواردن؛ شۆت واردەی ۲. شیرەخۆر بوون؛ بەر مەمکە بوون؛ شۆتەوەر بیەی ۳. شێر خواردن؛ شێر واردەی ‹خرگوش را شیر خورد: کەروێشکەکە شێر خواردی›.

**شیر دادن:** شیر دان؛ شیر داین؛ شۆت دەی/ دای: ۱. بەرهەم هێنانی شیر ‹هر یک از گاوها ۳۰ لیتر شیر می‌دادند: هەر کام لە مانگاکان ۳۰ لیتر شیریان دەدا› ۲. گوش کردن؛ بە منداڵێک شیر دان ‹داشت بچه را شیر می‌داد: خەریک بوو شیری دەدا بە منداڵەکە›.

**شیر دوشیدن** ☜ **دوشیدن ـ۱**

**شیر شدن:** */کنایی/* شێرگیر بوون؛ شێر بوون؛ شێرە بوون؛ بێباک و ئازا بوون. هەروەها: **شیر کردن**

**از شیر گرفتن:** لە شیر برینەوە؛ لە شیرگرتنەوە؛ شۆتەنە بریەیوە؛ خۆراک دان بە منداڵ لە جیاتی شیر ‹بچه را در هجده ماهگی از شیر گرفت: منداڵەکەی لە هەژدە مانگیدا لە شیر بریەوە›.

**شیرآلات** / šîrālāt, šîr'ālāt/: [فارسی/ عربی] */اسم/* ☜ **شیر ـ۴**

**شیرابه** / šîrābe ، ـها/: */اسم/* شیلە؛ شیلاوە؛ شیلی؛ شیرە؛ ئاووک؛ شیرەک؛ تراوێکی بێڕەنگ یان شیری ڕەنگە کە لە هەندێ گیاوە دەدەڵێ.

**شیرازه** / šîrāze ، ـها/: */اسم/* تابەن؛ شیرازە؛ شیراز؛ شلاڵە؛ بڕۆش: ۱. درووومانی لاپەڕەی کتێب یان دەفتەر ۲. تابەنێک کە لاپەڕەگەلی کتێب پێکەوە دەبەستێ.

▣ **شیرازه کاری گسیختن/ گسستن:** */کنایی/* پەتی کارێک پسان؛ لە نێو چوونی ڕێکوپێکی و سەروبەرەی کارێک ‹با مرگ پدرش شیرازەی کارها از هم گسیخت و کار بچه‌ها به گدایی کشید: بە مردنی باوکی پەتی کاریان پسا و منداڵەکان کەوتنە سواڵکردن›.

**شیرافکن** / šîrafkan/: */صفت/* شێرگر؛ شێرکوژ؛ زۆر دلێر و بەهێز ‹جوان شیرافکن: لاوی شێرگر›.

**شیراندام** / šîrandām/: */صفت./مجازی/* زنتۆل؛ کەڵەگەت؛ تێکسمراو؛ تێسمێرپاگ؛ خاوەن جەستە و شان و باهۆی بەهێز.

**شیربان** / šîrbān ، ـها؛ ـان/: */اسم/* شێرەوان؛ کەسێ کە ئەرکی ڕاگرتن و پاراستنی شێری وەئەستۆوە (لە باخی وەحش، سیرک و ...دا).

**شیربرنج** / šîrberenc/: */اسم/* شیربرنج؛ برنجبەشیر؛ شوتین؛ خۆراکێ کە لە کوڵاندنی برنج لە نێو شیردا دروست دەبێ.

**شیربها** / šîrbahā/: */اسم/* قەلەن؛ قەلەند؛ قەرەن؛ قالان؛ کەلەن؛ شیربایی؛ شیروایی؛ نەخت؛ پارە یان ماڵێ کە زاوا (یان بنەماڵەکەی) لە کاتی زەماوەندا دەبێ بیدەن بە بنەماڵەی بووک.

**شیرپاک‌خورده** / šîrepākxorde ، ـها/: */صفت./کنایی/* حەلالزادە؛ توخوم باوک خوەی؛ بەشەرەف و دروستکار.

**شیرپنیر** / šîrpanîr ، ـها/: */اسم/* بەناشوانە؛ نانەشوانە؛ ڕۆنیاسەگیا؛ سۆتیچکە؛ کەوڵەگیا؛ شیرگرسێن؛ گیاییێکی ئالیکی بە لەق و پۆی زبر و بلاو، گەڵای باریک و بەنئاسا، گوڵی وردی زەرد و بەری وشک و بۆنی هەنگوین و ماکێکی وەک هەوێنی پەنیر کە شێر دەگرسێنێ و هەروەها بۆ دەرمانیش دەشێ.

**شیرتوشیر** / šîrtûšîr/: */صفت./تعریض/* گورگ و تاو؛ هەڕەمەگوڵخار؛ کەربازار؛ کەس‌لەکەس؛ بێخاوەن ‹با رفتن مدیر قبلی وضع مدرسه خیلی شیرتوشیر شد: بە چوونی سەرۆکی پێشوو دۆخی قوتابخانەکە بوو بە گورگ و تاو›.

**شیرجه** / šîrce ، ـها/: */اسم/* گوپ؛ چراویلێ؛ لوور؛

بە تەوژم لە سەررا هاتنە خوار، بە شێوەیێ کە دەست وسەر بەرەوخوار بێ.

◘ **شیرجه رفتن**: گوژین؛ گوپ دان؛ لوور بوونەوە؛ چراویلێ لوەی؛ لە بەرزیەوە بازدان ‹شیرجه رفت توی آب: گوپی دا بۆ نێو ئاوەکە›.

**شیرخشت** / šîr(e)xešt/: اسم. شیرخشت؛ گزگەتوولین؛ توولەگزی: ١. پنچکە گیایەک لە تیرەی گوڵەسوورە ٢. ماکێکی شەکراوی کە لەم گیایەدا دەچۆڕێ و بۆ ڕەوان کردنی سک باشە.

**شیرخط** / šîrxat/: [عربی/ فارسی] ☜ **شیرياخط**

**شیرخوار** / šîrxār ، ـها؛ ـان/: صفت. شیرەخۆرە؛ شیرەخوەرە؛ بەرمەمکانە؛ بەرمەمکان؛ مەمڵەدەمێ؛ مەمکخۆر؛ مەمکەخۆرە؛ مەمکمژ؛ شیرخۆر؛ شیرڤەخار؛ شۆتەوەر (بۆ کوڕ)؛ شۆتەوەرە (بۆ کچ)؛ شیرمژ؛ منداڵی شیرخۆرە: ١. خاوەن تەمەنی کەمتر لە دوو ساڵان (سەبارەت بە مرۆ) ٢. خاوەن خوو یان تایبەتمەندی شیر خواردن لە باتی خۆراک.

**شیرخوارگاه** / šîrxārgāh ، ـها/: اسم. داینگە؛ دامەزراوەیەک بۆ پاراستن و ڕاگرتنی منداڵانی شیرخۆری بێسەرپەرشت.

**شیرخوارگی** / šîrxāregî/: اسم. شیرەخۆری؛ ماوەیەک لە ژیانی گیانداری گواندار لە کاتی لە دایک بوونەوە تا ئەو کاتەی لە شیر دەبڕێتەوە (لە مرۆدا بە ئاسایی تا دوو ساڵان).

**شیردار** / šîrdār ، ـها/: اسم. شیردار؛ دارێکی لێرەواری بە کۆتەرەیەکی لووس، گەڵای پەنجەیی و چێوی سپی شیلەدارەوە: **آج؛ آچ**

**شیردان** / šîrdān/: اسم. ١. شیلاو؛ شیلاوک؛ شیلاڤک؛ شیلافە؛ شیلاڤ؛ شیلاوگ؛ فرسک؛ فرێشک؛ پاژی چوارەم و بەشی سەرەکی گەدەی کاوێژکەران، بە لێوارێکی ئەستوور و چیناوی کە ڕیخۆڵەی بە شوێندا دێت ٢. شیردان؛ جێ شیر؛ سەتڵ یان هەر شتێ کە بۆ شیر تەرخان کراوە.

**شیردریایی** / šîredaryāyî/ ☜ شیر دریایی، **شیر**

**شیردل** / šîrdel ، ـها؛ ـان/: صفت. [مجازی] دڵشێر؛ ئازا؛ بوێر؛ ورەدار؛ بە ورە؛ نەترس؛ گەڕناس؛ مێرخوز؛ دلێر؛ مێرخاس؛ عەگید؛ بێباک؛ زاتدار.

**شیردوش** / šîrdûš ، ـها/: اسم. شیردۆش: ١. ئامرازی شیر دۆشین ٢. شۆتدۆشە؛ بێرەدۆش؛ بێریڤان؛ بێریبان؛ بێری؛ کەسێ کە کاری شیر دۆشینە.

**شیرده** / šîrdeh/: صفت. شیردەر؛ شیری؛ شیرا؛ بەشیر؛ توانا لە بەرهەم هێنانی شیر بە لۆگەلی گوانیەوە ‹گاو شیرده: مانگای شیردەر›.

**شیردهی** / šîrdehî/: اسم. شیردەری: ١. کار یان ڕەوتی بەرهەم هێنانی شیر لە لایەن گیانەوەری مێوە ‹شیردهی همزمان با زایمان آغاز می‌شود: شیردەری هاوکات دەگەڵ زاییندا دەست پێدەکا› ٢. کار یان ڕەوتی شیردان بە منداڵ ‹شیردهی به وسیلەی پستان مادر یا شیشەی شیر، هر سه ساعت یک بار: شیردان بە مەمکی دایکەوە یان بە شووشە شیر، هەر سێ سەعات جارێ›.

**شیرریز** / šîrrîz ، ـها/: اسم. شیردان؛ جێگەی شیر؛ تۆنگێکی چکۆلە بۆ دانان لە بان سفرە و کردنە ناو فنجانی شیر.

**شیرزاد** / šîrzād/: اسم. چەشنێ جلشین کە لە بەرهەمهێنانی ڕەنگدا بە کەڵک دێ.

**شیرزن** / šîrzan ، ـها؛ ـان/: اسم. [مجازی] شێرەژن؛ شێرەژەنی؛ سەرەژن؛ ژنی دلێر و نەترس.

**شیرسوز** / šîrsûz/: صفت. شیرمردە؛ شیرسووتوو؛ داڵگۆشت و لاواز لە بەر کەم شیری و لە سەردەمی شیرخۆرەییدا.

**شیرشکری**[1] / šîršekarî, šîršakarî/: [فارسی/ سنسکریت] اسم. ڕەنگی سپی ئاماڵ زەرد.

**شیرشکری**[2]: صفت. بە ڕەنگی سپی ئاماڵ زەرد.

**شــــیرفروش** / šîrfurûš ، ــهـا؛ ــان/: صــفت. شــیرفرۆش؛ شــۆتورەش؛ کەســێ کــە کــاری فرۆشتنی شیره. هەروەها: **شیرفروشی**

**شیرفهم** / šîrfahm/: [فارسی/ عربی] صفت. [مجازی، گفتاری] فامێنراو؛ فامیاگ؛ حالی؛ به تێگەیینێکی دروست و تەواو له مەڕ بابەتێکەوە.

▣ **شیرفهم شدن**: [مجازی، گفتاری] فامین؛ فام کردن؛ حالی بوون؛ بـه باشی لـه بابـەتێک تێگەیشتن ‹وقتی فهمیدم شیرفهم شده روانـەاش کردم: کاتێک زانیم فامی بەڕێم کرد بڕوا›.

**شــیرفهم کــردن**: [مجـازی، گفتـاری] فامانـدن؛ تێگەیاندن؛ حالی کردن؛ به باشی له بابـەتێک تێگەیاندن.

**شیرکاکائو** / šîrkākā'û/: [فارسی/ فرانسوی] اسم. شیرکاکاهوو؛ تێکەڵاوی شیر و شەکر و کاکـاهوو بۆ خواردنەوه.

**شیرگنجشک** / šîregonceŠk/: اسم. [جانورشناسی] سەوزەکەوا؛ کاسـکێنه؛ دارکونکـەره؛ دارەسمـە؛ کەنەسمـە؛ دارتەقێنـە؛ باڵـندەیێکی لـه کـۆتر گەورەتر و ڕەنگامەیه له کـونی درەختـدا دەژی، بۆق و مارمێلکه دەخوا، باڵی درێـژه و لـه کـاتی فڕیندا تەقله لێدەدا.

**شــیرگیاه** / šîrgiyāh ، ــهـا/: اسم. شــیرهەڵەز؛ خورایلــک؛ خوشــیلک؛ شــیرمار؛ ڕووەکێکــی جۆراوجۆره به گەڵای ئەستوورەوه که شیراوێکی ژەهراوی هەیه و بۆ دەرمان دەشێ.

**شیرمال** / šîrmāl/ ☜ نان شیرمال، **نان**

**شیرماهی** / šîrmāhî ، ــها؛ ــان/: اسم. شێرماسـی؛ شــێری دەریـا؛ جۆرێـک ماسـی ئـاوی شـۆره و درێژایی تا میترێک دەبێ: **ماهیشیر**

**شــیرمرد** / šîrmard ، ــهـا؛ ــان/: اسم. [مجازی] شێرەپیاو؛ شێرەپیاگ؛ کەڵەپیاو؛ مەرخوز؛ پیاوی ئازا؛ گەڕناس.

**شیرمـــست** / šîrmast/: صــفت. شــیرمەس؛ شیرمەســت؛ تێرشـیر؛ تێروتەسـەل بـه هـۆی خــواردنی شــیر (بـۆ شـیرەخۆران) ‹بچـه کـاملاً شیرمست شده بود و داشت می‌خندید: منداڵـەکه تـەواو شیرمەس ببوو و پێدەکەنی›.

**شیرموز** / šîrmowz, šîrmo:z/: اسم. شـیرمەوز؛ جۆرێـک ئـاومیوه تێکـەڵاوی مـەوز و شـیر و شەکەر.

**شیروانی** / šîrvānî ، ــها/: اسم. شیروانی؛ جۆرێک میچـی لێـژ پتـر لـه پـەڕەی ناسـکی ئاسـن. هەروەها: **شیروانیساز؛ شیروانیکوب**

**شیروخورشــید** / šîr-o-xoršîd/: اسم. نەخـشی شێرێکی ڕاوەستاو که شمشێرێکی له دەستدایه و هەتاوێکیش له پشت سەریەوه دەدرەوشێتەوه و تا پـێش ڕاپـەڕینی ئێران، نیشانی ڕەسمـی دەوڵەتی ئێران بوو.

▣ **شیروخورشید سرخ**: نـاوی پێـشووی هەیـڤی سوور له ئێراندا.

**شــیره** / šîre/: اسم. ١. دۆشـاو؛ دۆشـا؛ دمـس؛ شـۆک؛ خوشـاڤ؛ ئـاوگ؛ شـیراوگ؛ شـیلاو؛ جەلاقی؛ ئاوی میوەگەلی شـیرین کـه کـولاون ‹شیرەی انگور؛ شیرەی خرما: دۆشاوی ترێ؛ دۆشـاوی خورمـا› ٢. [گیـاهشناسـی] شـیله؛ شـیره؛ شـیلی؛ تراوێ که له نێو ساقەتەی ڕووەکاندا لـه گەڕدایـه ‹شیرەی پرورده: شیلەی پـەروەرده› ٣. [فیزیولوژی] شیلەی ڕیخۆڵه و گەده؛ تراوی ناو ڕیخۆڵـه یـان گـەدەی مۆرغـەداران ‹شـیرەی گـوارش: شـیلەی هەرسەک› ٤. شیره؛ مـاکێکی سـرکەره کـه لـه کولاندنی سووتکه تریاک دروست دەکرێ ‹روزی یک مثقـال شیره مـی‌کـشید: هـەموو ڕۆژێ مـسقاڵێ شـیرەی دەکێـشا› ٥. [مجـازی] ڕێـنج؛ گوشـیوه؛ ڕیوال؛ گووشراوه و داچۆڕاوی هەر شتێک.

▣ **شــیرەی انگــور**: دۆشـاب؛ دۆشـاو؛ دۆشـاڤ؛ شۆک؛ شووکه؛ مۆت؛ دمـس؛ مـووتی؛ مـۆتی؛ شیرەی ترێ.

**شیرەی بالارونده** ☜ **شیرەی خام**

**شیرەی پرورده**: [گیاهشناسی] شیرەیێ که پـاش

پـالافتن و خۆشـە بـوون بـەهۆی کاریگـەری تیشکەوە بەرهەم دێ و لە نـاو گیـادا وەگـەڕ دەکەوێ.

**شیرەی خام:** /*گیاەشناسی*/ ئـاوکی بـەرزەڕۆ؛ ئـاو مـاکی جۆراوجـۆر کـە بـەهـۆی ڕیـشووەوە هەڵدەکێشرێ و بە لقـدا دەچێتـە لاسـکەوە:

**شیرەی بالارونده**

**شیرەی رودە:** /*فیزیولوژی*/ شیرەی ڕیخۆڵە؛ تراوێ کە لە خانگەلی دەور و بەری ڕیخۆڵەی مۆرغەدارانـەوە دەدەڵـێ و لـە گوانداراندا لەخۆگری ئانزیمگەلی جۆراوجۆرە.

**شیرەی گوارش:** /*فیزیولوژی*/ هەر یەکە لەو تراوانە لە ئەندامگەلی کۆندامی هەرسەکی مۆرغەدارانەوە دەدەڵێت و لەخۆگری ئانزیمگەلی جۆراوجۆرە.

**شیرەی لوزالمعده:** /*فیزیولوژی*/ تراوێ کە لە لەوزەلمیعەدەوە دەدەڵێ و دەڕژێتە دوانزەگرێوە.

**شیرەی معده:** /*فیزیولوژی*/ شیرەی گەدە؛ تراوێ کە لە لووەکانی گەدەوە دەدەڵێن و لە گوانداراندا لەخۆگری ئانزیمگەل و ئەسید کولوریدریکە.

**شیرەی هسته:** /*زیستشناسی*/ ئەو بەشە لە ناوکەی سیلوول کە تراوە.

⊡ **شیرەی چیزی را کشیدن:** /*کنایی*/ گیان شتێ دەرهێنان؛ گیانی شتێک کێشان؛ شیرەی گیانی شتێک هەڵمژین؛ نزی شتێک چنین؛ نز لە شتێ بڕین؛ هەموو ماک و مافی بە کەڵکی شتێک لێ دەرهاوردن.

**شیرەای** / šîre'î ، ـهـا/: *صفت*. ١. شیرەیی؛ بەکاربەری شیرەی تریاک ٢. تریاکی.

**شیرەپز** / šîrepaz ، ـهـا/: *صفت*. دۆشاوگر؛ شیرەچی؛ کاموک؛ دۆشاوساز؛ دمس چێکر؛ کەسێ کە کاری چێکردنی شیرەی مێوەیە. هەروەها: **شیرەپزی**

**شیرەپزخانە** / šîrepazxāne ، ـهـا/: *اسم*. شیرەچیخانە؛ دۆشاوخانە؛ کارگەیەک کە شیرەی میوەی تێدا دەکوڵێنن.

**شیرەکشخانە** / šîrekešxāne ، ـهـا/: *اسم*. شیرەکێشخانە؛ شیرەخانە؛ جێگەیەک کە شیرە (و تریاک)ی تێدا دەکێشن.

**شیری**[1] / šîrî/: *اسم*. ١. شیرفرۆش؛ شۆت ورەش؛ کەسێ کە شیر دەفرۆشێ ٢. شیری؛ ڕەنگی سپی ئامال زەردی زۆر کاڵ. هەروەها: **شیریرنگ**

**شیری**[2]: *صفت*. شیری: ١. پێوەندیدار یان سەر بە شیر ‹غدەی شیری؛ مواد شیری: لووی شیری؛ ماکی شیری› ٢. شیراوی؛ تێکەڵ بە شیر ‹شکلات شیری: شوکولاتی شیری› ٣. بە ڕەنگی شیری ٤. شیرەخۆر؛ شیرخوەر؛ شۆتەوەر؛ بەرمەمکان؛ مەمکەخۆر؛ مەملەدەمێ؛ شیرقەخار ٥. شیرمژی؛ پێوەندیدار بە کاتی شیرخۆرە بوون ‹دندان شیری: ددانی شیری› ٦. /*گفتاری*/ شیردەر ‹گاو شیری: مانگای شیری›.

**شیریاخط** / šîryāxat/: [فارسی/ عربی]/*اسم*. شێر و خەت؛ شێرانخەت؛ بەرزیلان؛ ئەسکەملە؛ جۆرێ کایە یان گرێوە بە شێوەی هەڵخستنی سکەیەک و لە پێشگوتنی ئەوەی کە بە کام لادا دەکەوێ: **شیر۔خط**

⊡ **شیریاخط انداختن:** شێر و خەتکردن؛ شێر و خەت خستن ‹شیریاخط انداختیم، شیر آمد و او برنده شد: شێر و خەتمان کرد، شێر هات و ئەو بردیەوە›.

**شیرین**[1] / šîrîn/: *صفت*. ١. شیرین؛ شیرن ‹چای شیرین: چایی شیرین› ٢. /*مجازی*/ خۆش؛ وەش؛ دڵخواز؛ دلگر؛ وەبەردڵ؛ جوان ‹سخن شیرین؛ خواب شیرین: قسەی خوش؛ خەوی خۆش›.

⊡ **شیرین کاشتن:** /*مجازی*/ گاڵەکردن؛ گاڵە/سکە پێکردن؛ کارێکی چاک و بێگرفت ئەنجامدان ‹دروازەبانشان انصافاً شیرین کاشت:

گولێرەکەیان بە ڕاستی گاڵەی‌کرد›.

**شیرین**[٢]: *قید.[گفتاری]* ١. ڕاست؛ ڕاس؛ ڕێک؛ تەخت و تەواو ‹او پنجاه سال را شیرین داشت: ڕێک پەنجا ساڵی دەبوو› ٢. باش؛ لەبار؛ جوان؛ بە جۆرێکی دڵخواز یان زۆر چاک ‹خانه را شیرین فروختیم: خانووەکەمان باش فرۆشت›.

**شیرین‌بیان** / šîrînbayān، ـها/: *اسم.* شیرین‌بەلەک؛ مێلوک؛ بەلەک؛ هەکوک؛ مەکیک؛ مەکووک؛ مێکووک؛ مێکووکە؛ میمووک؛ مەلیم؛ مەلێم؛ ڕوەکێکی قنجی کێوی پایا لە تیرەی نۆکان، بە بەرزایی متر و نیوێک، قەد و گەڵای شیلاوی، گوڵی سپی، بنەوش یان مەیلەو شیری، ڕیشەی درێژ و شیرینەوە کە بۆ دەرمان و دروست‌کردنی کۆلاش کەڵکی لێوە دەگرن ✻ **سوس**

**شیرین‌پلو** / šîrînpolo:, -polow/: *اسم.* شیرین‌پڵاو؛ جۆرێک پڵاو کە زۆرتر بە گۆشتی مریشک، مرەبای خەلال نارنج (یان پرتەقاڵ)، خەلال بادام، خەلال پستە، ڕەواقی شەکەر، ڕۆن و زافەران دروستی دەکەن.

**شیرین‌زبان** / šîrînzabān/: *صفت.[مجازی]* زمان‌شیرین؛ زمان‌شیرن؛ خۆش‌زوان؛ خوش‌زوبان؛ قسەخۆش؛ دەڤخۆش؛ زمان‌خۆش؛ زارخۆش؛ دەڤنەرم؛ دەم‌پاراو؛ وتەپاراو؛ قسەپاراو؛ خۆش دەم و زمان.

**شیرین‌زبانی** / šîrînzabānî، ـها/: *اسم.[مجازی]* زمان‌شیرینی؛ قسەخۆشی؛ دەڤخۆشی؛ دەم‌پاراوی؛ خۆش‌زوانی؛ زمان‌خۆشی؛ زارخۆشی؛ چۆنیەتی قسەکردن بە ئاهەنگ و شێوەیەکی دڵگرەوە ‹دخترشان تازه زبان باز کرده بود و مرتب شیرین‌زبانی می‌کرد: کچەکەیان تازە زمانی‌گرتبوو و لە پەستا زمان‌شیرینی دەکرد›.

**شیرین‌سخن** / šîrînsoxan/: *صفت.[مجازی]* وتەپاراو؛ قسەجوان؛ وتەجوان؛ شەکرشکێن؛ قسەپاراو؛ زمان‌پاراو ‹شاعر شیرین‌سخن: شاعیری وتەپاراو›.

**شیرین‌عقل** / šîrînaql,-'aql/: [فارسی/ عربی] *صفت.[مجازی، گفتاری]* بێ‌ئاوەز؛ گێل؛ سایلۆح؛ کانا؛ دواکەوتووی زەینی.

**شیرین‌کاری** / šîrînkārî، ـها/: *اسم.[مجازی]* شیرین‌کاری؛ کارێکی سەرنج‌ڕاکێش، دڵگر یان سەرسووڕێنەر. هەروەها: **شیرینکار**

**شیرینی** / šîrînî/: *اسم.* شیرینی؛ شیرنی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی شیرین بوون ‹ببین شیرینی‌اش خوب است؟: بزانە شیرینیەکەی باشە؟› ٢. یەکێک لە چوار چێژی سەرەکی کە بە بەشی پێشەوەی زمان هەست دەکرێ (وەک چێژی ماکی شەکری) ٣. /ـها؛ ـجات/ چەرەی چێکراو لە ماکە شەکریەکان، بەتایبەت ئەوەی لە ئارد، ماکی شەکری، ڕۆن یان کەرەیە ٤. ئەوەی کە (لە دیاری و خواردەمەنی) بە بۆنەی بەڕێوەچوونی کارێک یان ڕووداوێکی خۆشەوە بە خزم و دۆستانی دەدەن ‹کی می‌خواهی شیرینی عروسی‌ات را بدهی؟: کەی دەتەوێ شیرینی گۆڤەندەکەت بدەی؟›. هەروەها: **شیرینی دادن؛ شیرینی گرفتن**

▣ **شیرینی کسی را خوردن:** *[کنایی]* شیرینی کەسێک خواردن؛ بوونە دەزگیران؛ بە بۆنەی وەڵامدانەوە و پەسندکردنی بووک لە زاوا، ڕێوڕەسمی شیرینی‌خۆران ڕێکخستن ‹شیرینی سارا را برای آزاد خوردەاند: شیرینی سارایان بۆ ئازاد خواردووە›: **شیرینی‌خوران**

**شیرینی‌پز** / šîrînîaz، ـها/: *اسم.* شیرینی‌پەز؛ شیرینی‌لێن؛ قەناد؛ کەسێ کە کاری دروست‌کردنی شیرینیە.

**شیرینی پزی** / šîrînîpazî/: *اسم.* شیرینی‌پەزی؛ شیرینی لێنی: ١. کار و ڕەوتی شیرینی دروست‌کردن ٢. /ـها/ کارگەیەک کە لەوێدا شیرینی دروست دەکەن.

**شیرینی‌جات** / šîrînîcāt/: [فارسی/ از عربی] جمعِ

☜ **شیرینی**

**شیرینیخوران** / šîrînîxorān /:/اسم. شیرنیخۆران؛ شیرینیخوەران؛ زەماخوا؛ ڕێورەسمێ کە دوای وەڵامی خوازبێنی و بەر لە مارە برین بەڕێوە دەچێ و زاوا بۆ ماڵی هاوسەری داهاتووی شیرینی دەنێرێ و لەوێدا جەژنێک ڕێکدەخەن ‹دیروز شیرینیخوران دختر سارا خانم بود: دوێنێ شیرینیخۆرانی کچەکەی خاتوو سارا بوو›.

**شیرینیخورده** / šîrînîxorde /:/ صفت. دیاریکراو؛ نیشانکراو؛ دەزگیراندار؛ ناوبریاگ بۆ زەماوەند دەگەڵ پیاوێکدا ‹شیرینیخوردەی پسر کدخداست: دیاریکراوی کوڕی کوێخایە›.

**شیرینیفروشی** / šîrînîfurûšî /:/اسم. شیرینیفرۆشی؛ قەنادی: ١. کار و باری شیرینی فرۆشتن ٢. /ـها/ دووکانی قەنادی؛ دووکانی شیرینیفرۆشی.

**شیزوفرنی** / šîzofernî /: [آلمانی] ☜ **اسکیزۆفرنی**

**شیست** / šîst /: [؟]/اسم. ئەردەواڵ؛ هەردەواڵ؛ جۆرێ بەردی پەڕەـپەڕەی وەکوو پووڵەکە.

**شیشعان** / šîša'ān ، ـها/: [عربی]/اسم. دارچکێکی گچکە لە تیرەی گەز، بە لاسکی ڕاست، گەڵای چکۆلەی پووڵەکە ئاسای شین و گوڵی ئاڵی هێشوویەوە کە زۆرتر لە قەراخ ڕووبارانـدا دەڕوێ.

**شیشک** / šîšak /:/اسم. شیشەک؛ شەک؛ پەزی کەم تەمەن تا یەک ساڵان.

**شیشکی** / šîšakî /:/اسم./مستهجن/ شیڕ؛ شێڕ؛ شڕ؛ قت؛ جرت؛ عەفتە؛ چورت؛ زرت؛ جرت؛ دەنگێ وەک دەنگی بای زگ، کە بە نیشانەی سووکایەتی و تیز پێ کردن بە دەم دەریدێنن.

▣ **شیشکی بستن:** شیڕ داهێشتن؛ جرت/ جر لێدان؛ شیڕ لێدان؛ شێڕ ئاسەیرە؛ دەنگی شیڕ بە لێو دەرهێنان ‹وقتی از خیابان رد شد، برایش شیشکی بستند: کاتێ بە خیاباندا ڕۆیشت، شیڕیان بۆ داهیشت›.

**شیشلیک** / šîšlîk ، ـها/: [ترکی]/اسم. کەوابێکی پتر لە گۆشتی ڕاستەی پەز یان گا.

**شیشه** / šîše ، ـها/:/اسم. شیشە؛ شووشە؛ شیشێ؛ شوویشە؛ مینا؛ جام؛ وەنەدیک؛ گزگزە: ١. ماکێکی ڕەق، تورت و بێبیچمە و لە سروشتدا بەدیدێ ٢. رووپەڕێکی ڕێک لەو جنسە کە بۆ داپین کردنی ڕووناکی لە سەر دەلاقە یان ڕۆچنەدا دایدەنێن ‹شیشەی پنجرە؛ شیشەی ماشین: شیشەی دەلاقە؛ شووشەی ماشین› ٣. دەفرێ لەو ماکە بۆ پاراستن و ڕاگرتنی شتێک ‹شیشەی عطر؛ شیشەی دارو: شیشەی عەتر؛ شووشەی دەوا› ٤. ئامرازێکی درووسکراو لەو ماکە ‹شیشەی چراغ؛ شیشەی عینک: شووشەی چرا؛ شیشەی چاویلکە›.

▣ **شیشەی آبدادە** ☜ **شیشەی نشکن**

**شیشەی آتشخوار** ☜ **شیشەی نسوز**

**شیشەی آتشفشان:** شووشەی گڕکان؛ گزگزەی گڕکان؛ شووشەیەکی سروشتیە کە لە سارد بوونەوەی خێرای گڕکان بەدی دێ.

**شیشەی اسفنجی:** شیشەی هەوری؛ ماکێکی شیشەیی ڕەش، لێڵ، سووک، چێوپەمەئاسا و و بەرگری گەرما، کە لە گڕ پێدانی گەردی شووشە دەگەڵ کەربوندا دروست دەبێ.

**شیشەی اطمینان/ ایمنی:** جۆرێ شیشەی دوولۆیە کە لە نێویدا پەڕەیەکی پلاستیکی ڕوونیان داناوە تا ئەگەر شکا، بلاوە نەکا.

**شیشەی جام:** جام؛ مینا؛ شووشەی دەرگا و دەلاقە؛ شیشەی تەخت کە بۆ ڕۆشنایی گرتن بەکاردێ.

**شیشەی چراغ:** بلەور؛ مالچرا؛ پیران؛ شووشەچرا؛ شیشەچرا؛ شیشە چراوی؛ گرداپۆشی چرا؛ گرۆڤەرێکی شیشەیی کە بۆ پەخشاندنی تیشکی چرای نەوتی یان گاز

سووت، لە سەریەوە دایدەنێن.

**شیشەی رنگی:** شیشەی ڕەنگی؛ شووشەی ڕەنگامە؛ شیشەیێ کە لەگەڵ ماکێکی ڕەنگی تایبەتیدا تێکەڵ کراوە و شتەکانی پشتی بەو ڕەنگە دەبینرێن.

**شیشەی سرب:** شووشەی سرپی؛ جۆرە شیشەیێ لە سیلیکاتی سرپ کە لە ئامێرە نووریەکاندا بە کار دێت.

**شیشەی شیر:** شیشە شیر؛ شووشە شیر؛ شیشە شۆت؛ شیرمژە؛ بوتریکی چکۆلە بە مەمکەمژێکەوە بۆ شیرپێدانی منداڵی ساوا.

**شیشەی ضدگلوله:** شیشەی دژە گوللە؛ شیشەی ئەستووری زۆر تۆکمە وا کە گوللە نەیسمێ.

**شیشەی عمر:** ١. *[فرهنگ‌مردم]* شووشەیەک کە لە ئەفسانەکاندا گیانی دێوی تێدایە و بە شکانی دێوەکە دەمرێ ٢. *[مجازی]* شووشەی تەمەن؛ گیان؛ هەوێنی ژیان.

**شیشەی عینک** ☜ **عینک**

**شیشەی فتوکرومیک:** شیشەی فتۆکرۆمیک؛ شیشەیێ کە ڕەنگی بە زۆر بوونی تیشک، تۆخ و بە داکشانی ڕوون دەبێتەوە.

**شیشەی نسوز:** شیشەی نەسووز؛ شووشەی نەسۆچ؛ شیشەیێ تێکەڵ لە سیلیس، ئەلومینیۆم، ئوکسیدی بوور و ماکێکی بازی کە لە هەمبەر گەرمای بە تەوژم و ئاگرەوە خۆگرە: **شیشەی آتشخوار**

**شیشەی نشکن:** شیشەی/ شووشەی نەشکەن؛ شیشەیێ کە بە هۆی ئاو دانەوە پتەوکراوە و لە چاو شیشەی‌تر دێر دەشکێ: **شیشەی آبداده**

**شیشە و سنگ:** *[کنایی]* بەرد و شیشە؛ کارد و پەنیر؛ ئاگر و پووش؛ ئاگر و کا؛ دوو شت کە بوونیان پێکەوە جێگای مەترسیە.

**شیشەای** / šîše'î/: *صفت.* شووشەیی؛ شیشەیی؛ دروستکراو لە شووشە ‹درِ شیشەای؛ ظرف شیشەای: دەرکی شووشەیی؛ دەفری شیشەیی›.

**شیشەبر** / šîšebor، ـها/: *اسم.* شووشەبڕ؛ شیشەبڕ: ١. جامچی؛ شووشەکار؛ کەسێ کە کار و باری بڕین و جێ‌خستنی شووشەیە ٢. ئامرازی بڕینی شیشە.

**شیشەبری** / šîšeborî، ـها/: *اسم.* شووشەبڕی؛ شیشەبڕی: ١. کار و پیشەی کەسێ کە شووشە دەبڕێ و دەفرۆشێ ٢. کارگەیێ کە شیشەبڕ تێیدا کار دەکا و شیشە بە خەڵک دەفرۆشێ.

**شیشەپاک‌کن** / šîšepāk.kon، ـها/: *اسم.* شیشەشۆر؛ شووشەسڕ؛ شیشەسڕ: ١. کەسێ کە پیشەی خاوێن‌کردنەوەی شووشەی دامەزراوەگەل، خانوو یان ماشینی دیتران بێ ٢. ئامێرێک بە بیچمی «T» کە بەشی ئاسۆییەکەی لە هەورە و بۆ خاوێن‌کردنەوەی شیشەی دەلاقەی بەرز و دوور بەکار دێت ❊ **شیشەشوی**

**شیشەخرده** / šîšexorde، ـها/: *اسم.* وردەشووشە؛ وردەشیشە؛ وردە و درشتی شووشەیەک کە شکاوە ‹لیوان شکست و شیشەخردەهایش ریخت روی قالی: پەرداخەکە شکا و وردەشووشەکانی ڕژانە سەر قالیەکە›.

▣ **شیشەخرده داشتن:** *[مجازی]* وردەشیشە هەبوون؛ بەدفەڕ و مەردومئازار بوون ‹این دوست تو قدری شیشەخوردە دارد: ئەم دۆستەت تۆزێک وردەشیشەی هەیە›.

**شیشەخور** / šîšexor/: *اسم.* شووشەخۆر؛ شیشەخوەر؛ ئەو بەشە لە ڕووکاری دەرگا، دەلاقە و... کە بۆ هاتنە ژووری تیشک ئاوالایە و جێی شیشەی جامە.

**شیشەسازی** / šîšesāzî، ـها/: *اسم.* شووشەسازی؛ شیشەسازی؛ کارخانەیەک کە شووشەی تێدا دروست دەکەن.

**شیشەشور** / šîšešûr، ـها/: *اسم.* شووشەشور؛

شیشه‌شۆر.

**شیشه‌شوی** / šîšešûy/: *اسم*. ۱. ☜ **شیشه‌پاک‌کن** ۲. شووشه‌شۆر؛ شیشه‌شۆر؛ پێشۆرێکی تراو کە بۆ خاوێن‌کردنەوەی شیشە بەکاردێت ۳. ☜ **بطری‌شور** ✽ **شیشه‌شور** *[گفتاری]*

**شیشه‌کاری** / šîšekārî/: *اسم*. شیشەکاری؛ کار یان ڕەوتی خستنە جێی شیشەی جام ‹شیشه‌کاری ساختمان فردا تمام می‌شود: شیشەکاری خانووبەرەکە سبەینێ دوایی دێ›. هەروەها: **شیشه‌کار**

**شیشه‌گر** / šîšegar، ـها؛ ـان/: *اسم*. شیشەگەر؛ شووشەگەر؛ پیشەگەرێ کە لە کارگەی دەستیدا و بە شێوەی سوننەتی جام دروست دەکا.

**شیشه‌گرخانه** / šîšegarxāne/ ☜ **شیشه‌گری ـ۱**

**شیشه‌گری** / šîšegarî/: *اسم*. ۱. /ـها/ شووشەگەری؛ کارگەی سوننەتی شووشە دروستکردن: **شیشه‌گرخانه** ۲. پیشەی شیشەگەر.

**شیطان**[1] / šeytān/: [عربی] *اسم*. ۱. *[اسلام]* شەیتان؛ ئەهریمەن؛ ئیبلیس؛ دۆزاک؛ فریشتەیێ کە بە هۆی ملنەدان بە فرمانی خودا، لە ئاسمانی بەرزەوە دەرکرا و هاتە زەوی تا خەڵک هەڵفریوێنێ و بەرەو خراپەکاری و گوناه هانیان بدات ۲. /ـها؛ شیاطین/ *[مجازی]* بوونەوەرێ کە کاری بشێوە نانەوە و مرۆ هاندانە بەرەو خراپەکاری.

◘ **شیطان در جلد کسی رفتن:** *[مجازی]* شەیتان چوونە بن کلێشەی کەسێکەوە؛ بە شوێن کارێکی ناحەزەوە بوون.

**شیطان را درس دادن:** *[مجازی]* دوو ڕۆژ بەر لە شەیتان لە دایک بوون؛ گرەو لە شەیتان بردنەوە؛ شەیتان دەرس دان؛ دەس شەیتان لە پشتەوە بەستن؛ دایک شەیتان گایین؛ زۆر گزیکار بوون.

**شیطان**[2] / ـها/: *صفت*. *[گفتاری]* هاروهاج؛ بزێو؛ تروسک؛ شەیتان ‹دخترک خیلی شیطان بود و توجه همه را به خود جلب کرده بود: کچۆڵەکە زۆر هاروهاج بوو، سەرنجی هەمووی بۆ لای خۆ ڕاکێشابوو›.

**شیطان زیتون** / šeytānezeytûn/: [عربی] ☜ **سنجدتلخ ـ۲**

**شیطان‌صفت** / šeytānsefat، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت*. پەست و پیس؛ خاوەن خوو و ئاکاری دزێو و نالەبار.

**شیطانک** / šeytānak، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. شەیتانەک؛ جۆرێک گیرە یان وەخۆگری لەولاوی لە هێندێک لە ماشینە جۆراوجۆرەکاندا (وەک چەرخی دروومان) کە دەگەڵ لێوارە، قولاب یان ددانەدا یەک دەگرن و بۆ بەرگری لە هەڵگەڕانەوە یان لوول خواردن، وەک قولاب یان وەخۆگر بە کار دەڕوا.

**شیطانی**[1] / šeytānî، ـها/: [عربی] *اسم*. *[مجازی]* هار و هاجی؛ بزێوی؛ تروسکی؛ شەیتانی؛ چۆناوچۆنی بە دەس و پاوە نەوەستان و گوێ بە کەس نەدان، کە دەبێتە هۆی ئازاری خەڵکی.

**شیطانی**[2]: *صفت*. شەیتانی؛ پێوەندیدار یان سەر بە شەیتانەوە ‹خنده‌ی شیطانی؛ توطئه‌ی شیطانی: پێکەنینی شەیتانی؛ پیلانی شەیتانی›.

◘ **شیطانی شدن:** *[گفتاری]* شەیتانی بوون: ۱. شەیتان پێکەنین؛ خەو بە گانەوە دیتن ۲. بە شێوەی نەخوازراو ئاو هاتنەوە.

**شیطنت** / šeytanat، ـها/: [عربی] *اسم*. ۱. شەیتانی؛ بەدفەڕی؛ هەڤانی؛ کەلپەی؛ سەگایەتی؛ کاری دزێو، بەتایبەت گزیکاری و پیلانگێڕی و شۆفاری ۲. *[مجازی]* هار و هاجی؛ کایەکلێ و بە دەس و پاوە نەوێسان کە دەبێتە هۆی ئازاری خەڵک.

**شیطنت‌آمیز** / šeytanatāmîz, -'āmîz/: [عربی/ فارسی] *صفت*. کەلپەیانە؛ بە هار و هاجیەوە.

**شیطنت‌بار** / šeytanatbār/: [عربی/ فارسی] *صفت*.

کەلپەیانە؛ هاوڕێ لەگەڵ هار و هاجیەوە ‹نگاه شیطنت‌بار: ڕوانینی کەلپەیانە›.

**شیعه**[1] / šî'e/: [عربی]/اسم. شیعه؛ شێعە: ١. هەر یەکە لەو ڕێبازانەی کە جێگری پێغەمبەری ئیسلام بە مافی ئامۆزاکەی، واتا عەلی کوڕی ئەبی‌تالب دەزانن ٢. شێعەی دوازدە ئیمامی؛ شێعەی جەعفەری ٣. ـها؛ شیعیان/ هەر یەکە لە شوێنکەوتوانی ئەو ئایینە.

**شیعەی اثناعشری** ☜ **شیعەی جعفری**

**شیعەی اسماعیلی:** ئیسماعیلیە.

**شیعەی جعفری:** شێعەی جەعفەری؛ ئایینێ کە بڕوای بە ئیمام بوونی عەلی کوڕی ئەبی‌تالب و یازدە کەس لە منداڵان و نەوەکانی و هەروەها سەرهەڵدانی ئیمامی پێوار لە ئاخری دونیادایە: **شیعەی اثناعشری؛ شیعەی دوازده امامی**

**شیعەی دوازده امامی** ☜ **شیعەی جعفری**

**شیعەی زیدی:** زەیدیە؛ لقێکی ڕێبازی شێعەیە کە شوێنکەوتوانی زەید کوڕی عەلی کوڕی حوسێن بە ئیمامی پێنجەم و دوایین ئیمام دەزانن.

**شیعه**[2]: *صفت.* شیعە؛ شێعە؛ شوێنکەوتووی ڕێبازی شیعە.

**شیعی** / šî'î/: [عربی] *صفت.* شێعە؛ شیعە؛ شوێنکەوتووی مەزهەبی شیعە.

**شیفت** / šîft ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. شیفت؛ گەکار؛ نۆرەکار؛ نۆبەکار؛ نۆگەکار ‹شیفت صبح؛ شیفت شب: شیفتی بەیانی؛ شیفتی شەو›.

**شیفتگی** / šîftegî ، ـها/:/اسم. دڵ‌لێچوویی؛ دڵ‌داناوی؛ دڵبەندی؛ کاسۆتەیی؛ گراوی؛ دڵ‌گیرۆدەیی زۆر کە دەبێتە هۆی ئاڵۆز بوونی بیر.

**شیفته** / šîfte ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* کاسۆتە؛ دڵ‌لێچوو؛ دڵ‌لێچووگ؛ شێ‌شنگ؛ گراو؛ شەیدا.

**شیفتی**[1] / šîftî/: [انگلیسی] *صفت.* شیفتی؛ نۆرەکاری؛ بەنۆبە ‹کار شیفتی دردسر زیادی دارد: کاری شیفتی کێشەی زۆری هەیە›.

**شیفتی**[2]: *قید.* ١. نۆرەیی؛ گەکاری؛ شیفتی؛ بە نۆرەکاری ‹او شیفتی کار می‌کند: ئەو شیفتی کار دەکا› ٢. شیفتێ؛ شیفتێک؛ لە هەر شیفتێکدا ‹شیفتی پنجاه عدد کولر تولید می‌شود: شیفتی پەنجا دانە کولێر درووس دەبێ›.

**شیک** / šîk/: [فرانسوی از آلمانی] *صفت.* نەرمەنیشک؛ لەبار؛ تیف؛ فەرز؛ فرز؛ تروسک؛ خوشیک؛ لهەڤ؛ قۆز؛ کنف؛ کەشخە: ١. جوان و شیاو؛ ڕێک و پێک؛ تەکووز؛ تەڕ ‹ماشین شیک؛ خانەی شیک: ماشینی تیف؛ خانووی ڕێک و پێک›. ٢ جوان، پێکەوتوو و بەژن‌زراڤ.

▣ **شیک شدن:** تیف بوون؛ نەرمەنیشک بوون؛ تەکووز بوون؛ لەبار بوون؛ خوشیک بوون؛ ئاراستە و پێکەوتوو بوون. هەروەها: **شیک کردن**

**شیکپوش** / šîkpûš ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] *صفت.* خۆشپۆش؛ تەڕپۆش؛ تەڕەنداز ‹یک آقای شیکپوش بالای اتاق نشسته بود: پیاوێکی خوشپوش لە ژوورەوەی دیوەکە دانیشتبوو›. هەروەها: **شیکپوشی**

**شیک‌وپیک** / šîk-o-pîk/: [فرانسوی/ فارسی] *صفت. [گفتاری]* نەرمەنیشک؛ لەبار و شیاو؛ فۆقڵ؛ ڕێک‌وپێک ‹چە خبر است؟ امروز خیلی شیک‌وپیک شده‌ای: چ خەبەرە؟ ئەوڕۆ زۆر نەرمەنیشکی›.

**شیکی** / šîkî/: [فرانسوی]/اسم. کەشخەیی؛ تەکووزی؛ خوشیکی؛ قۆزی؛ تیفی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تەکووز بوون ‹هر چە در می‌آورد خرج شیکی خودش می‌کرد: هەرچێکی دەردێنا دەیکردە خەرجی کەشخەیی خۆی›.

**شیل** / šîl/:/اسم. ماشە؛ بەربەستێکی لە لق و پۆی دار و درەخت بە سەر ڕووباردا بۆ ماسی گرتن.

**شیلات** / šîlāt/: [فارسی/ عربی]/اسم. ١. پیشەی

ماسی گرتن ٢. دامەزراوەگەلی پێوەندیدار بەم پیشەوە.

**شیلان** / šîlān/: [مغولی]/اسم. [نامتداول/ ١. خوان؛ سفرەی پڕ لە خواردەمەنی ٢. میوانی؛ مێمانی گەورە؛ میوانی شایانە.

▣ شیلان کشیدن: /مجازی/ میوانی گەورەدان؛ شایانە دان.

**شیلم** / šeylam ، ـها/: /اسم. گیاگەنمە؛ زیزانە؛ گیایێکی ئالیکی یەکسالە بە لاسکی درێژ، گەڵای باریک و تەخت و گوڵی درکنەوە کە زۆرتر لە زەوی بە باردا دەڕوێ.

**شیلنگ** / šilang ، ـها/: [از آلمانی]/اسم. شلەنگ؛ شیلانگ؛ شلێنگ؛ تیپێن؛ لوولەیەک لە ماکی نەرمژ (لاستیک یان پلاستیک) بۆ گواستنەوەی تراو: **شِلنگ** [گفتاری]

**شیله** / šîle/ ☜ **شیل**

**شیله‌پیله** / šîlepîle ، ـها/: /اسم. [گفتاری] گزی‌وفزی؛ گەڕوگێچەڵ؛ فڕوفێڵ؛ فاکوفیک ‹خیالت راحت باشد، شیله‌پیله‌ای در کار نیست: خەیاڵت تەخت بێ، هیچ گزی‌وفزیەک لە کاردا نیە›.

**شیلینگ** / šîlîng/: [آلمانی]/اسم. شیلینگ: ١. لە پاژەکانی پارەی بریتانیا لە پێشوودا کە بەرامبەر بە ١٢ پینی بوو ٢. یەکەی پارەی بڕێک لە وڵاتانی ئەفریقایی (وەک: کینیا، سوومالی، تانزانیا و ئوگاندا).

**شیمی** / šîmî/: [فرانسوی]/اسم. کیمیا؛ شیمی؛ زانستی پێکهاتەی بنەمایی ماک و تێکەلاوی، گۆڕان، پێکهاتن، کاردانەوە، شیکاری و بەرهەمهێنانی ماکگەل.

▣ **شیمی آلی**: کیمیای زیندەوەر؛ شیمی زیندەوەر؛ زانستی لێکدانەوە و خوێندنەوەی پێکهاتە، بەرپەرچ و تایبەتمەندی لێکدراوەگەلی ئاڵقەیی یان زنجیری کەربون.

**شیمی ساخت** ☜ **شیمی صنعتی**

**شیمی سنتز** ☜ **شیمی صنعتی**

**شیمی صنعتی**: کیمیای پیشەسازی؛ شیمی پیشەسازی؛ شیمی سەر بە چێ‌کردنی لێکدراوەگەل لە ماکی سادەتر: **شیمی ساخت؛ شیمی سنتز**

**شیمی فضایی**: لقێک لە زانستی شیمی، تایبەت بە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی دۆخی فەزایی ئەتومگەلی پێکهێنەری مولوکوولێک.

**شیمی گرمایی**: شیمی گەرمایی؛ لقێک لە زانستی شیمی- فیزیک کە لە سەر پێوەندی گەرما و تیشکگەلی گەرماییەوە لە ڕەوتی ئاڵوگۆڕە کیمیایەکاندا دەکۆڵێتەوە.

**شیمی معدنی**: شیمی کانگایی؛ زانستی تۆژینەوە و لێکدانەوەی چۆنیەتی و تایبەتمەندی هەموو ماک و لێکدراوەی زەمین، بێجگە زیندەوەر.

**شیمیائی** / šîmiyā'î/: [فرانسوی/ فارسی] ☜ **شیمیایی**

**شیمیایی** / šîmiyāyî/: [فرانسوی/ فارسی] صفت. کیمیاوی؛ شیمیایی: ١. پێوەندیدار بە شیمیەوە ‹آزمایش شیمیایی: ئەزموونی کیمیاوی› ٢. دروستکراو بە هۆی ڕەوتی شیمیاییەوە ‹مواد شیمیایی: ماکی کیمیاوی› * **شیمیائی**

▣ **شیمیایی شدن**: /گفتاری/ کیمیایی بوون؛ شیمیایی بوون؛ کەوتنە بەر زەرەر و زیانی ماک یان بومبی کیمیاویەوە ‹مردم شهر حلبچه‌ی کردستان شیمیایی شدند: خەڵکی هەڵەبجەی کوردستان کیمیایی بوون›.

**شیمیدان** / šîmîdān ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] اسم. کیمیازان؛ شیمی‌زان؛ کەسێ کە کاری لێ‌کۆڵینەوە و توێژینەوەی شیمی یان ڕەوتگەلی شیمیاییە: **شیمیست**

**شیمی‌درمانی** / šîmîdarmānî/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. کیمیادەرمانی؛ شیمی‌دەرمانی؛ کار و ڕەوتی دەرمان‌کردنی نەخۆش بە ماکی شیمیایی.

**شیمیست** / šîmîst/: [فرانسوی] ☜ **شیمیدان**

**شـــین** / šîn/:/اسـم. شـــین؛ نـــاوی عـــەرەبی شانزدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**شینتو** / šînto/: [انگلیسی از ژاپنی]/اسم. شینتۆ؛ دینی باو لە وڵاتی ژاپون کە لـە سـەر بنـەمای پەرەســتینی چاکــان، خوداکــان و بــاوەڕ بــە ئاسمانی بوونی ئیمپراتۆر پێکهاتووە.

**شیوا**[1] / šîvā/: [سنسکریت] /اسم. شیوا؛ لـە ئایینـە هێندووەکان کـە لـە سـەر پەرستـشی خـودای نـــابوودی و ژیانـــەوە دامـــەزراوە و لـــە شـــێوەی کەسێکدایە کە لە سەر پێستی بەبر دانیشتووە و مارێکیشی لە سەر شان یان لە پەنایە.

**شیوا**[2]: صفت. پـاراو؛ ڕەوان (سـەبارەت بـە قـسە) ‹بیان شیوا: وتەی پاراو›.

**شیوائی** / šîvā'î/ ☜ **شیوایی**

**شـــیوایی** / šîvāyî/:/اسـم. پـــاراوی؛ ڕەوانی؛ ڕەوانــوێژی؛ دۆخ یــان چۆنیــەتی دانــە دانــە، ڕێکوپێک و دڵگر بوونی قسە: **شیوائی**

**شیوخ** / šiyûx, šuyûx/: [عربی] جمعِ ☜ **شِیخ**

**شـیوع** / šîyû', šuyû'/: [عربـی]/اسـم. تەشــەنە؛ بڵاوە؛ پەرە؛ داکــەوتوویی؛ کــار یــان ڕەوتی بــڵاو بوونەوە ‹شیوع بیماری: تەشەنەی نەخۆشی›.

▣ **شیوع داشـتن:** پـەرە سـەندن؛ پـەرەسـاندن؛ زۆرگرتن؛ پەرەگرتن؛ تەشەنە سەندن ‹اسـهال در میان شیرخواران شیوع داشـت: زگچـوون لـە نێـو شیرەخۆرەکاندا پەرەی سەندبوو›.

**شیوع یافتن:** پەرە سـاندن؛ پـەرەگرتن؛ پـەرە سەندن؛ داکەوتن؛ تەشـەنە سـەندن ‹هفتـەی گذشـته آنفلـوآنزا در شـهر شـیوع یافـت: حـەوتووی ڕابردوو پەتا لە نێو شاردا پەرەی‌ساند›.

**شیون** / šîvan ، ـها/:/اسم. شیوەن؛ شین؛ شەپۆڕ؛ شین و شەپۆڕ؛ کەلگری؛ نەهار؛ نهـار؛ چەمـەرە؛ وەشت؛ وەی؛ ڕۆ؛ زاری؛ کتارو؛ چەمبەرە؛ ڕۆ-ڕۆ؛ براڕۆ؛ بابەڕۆ؛ بانگ؛ گریان و شیوەن بـە دەنگـی بەرزەوە لە کاتی شینگێڕاندا.

▣ **شیون کـردن:** شـین کـردن؛ شـیوەن کـردن/ کەردەی؛ گیریـان؛ شـەپۆڕکردن؛ زاریـان؛ بـە دەنگی بـەرز و بـە هەنـسک و نالـەوە گریـان ‹دخترش خیلی شیون می‌کرد: کچەکەی زۆر شینی دەکرد›.

**شیوه** / šîve ، ـها/:/اسم./ادبی/ ١. شـێوە؛ شـێل؛ شــیوە؛ زێ؛ ڕێوزێ؛ چۆنیەتیـەکی تایبـەت بـۆ بەڕێوە بردنی کارێـک ‹در نوشتن شیوەی خاصی داشـت: لـە نووسـیندا شـێوەیەکی تایبـەتی هـەبوو› ٢. شـێواز؛ ڕەســـمویاســـا؛ ڕێوڕەســـم؛ داب؛ ڕێوشوێن؛ دامو/ دابودەسـتوور؛ دابونـەریت؛ کەسم؛ کسم؛ داب؛ ڕێوشوێن؛ ڕست.

**شــــیوەگرایــــی** / šîvegerāyî/:/اســـم. ١. ســاختەکاری؛ شــێوەوازی؛ شــوێنکەوتوویی زێدەڕەوانــە لــە شــێوازێک یــان ڕێوزیێــک ٢. ڕێبازێک لە وێنەکێشی سەدەی ١٦ی زایینی لـە ئورووپـادا ٣. شـێوەیەکی تایبـەت و زۆرتـر بـێ‌خەبەرانـە لـە ئاکـار، بـە جـێ‌هێنـان یـان کردەوەدا.

**شیوەنامـه** / šîvenāme ، ـها/:/اسم. شـێوەنامە؛ نووســراوەیەک کــە شــێواز و دامودەســتووری پێوەندیـــدار بـــە نووســـینی شـــتگەلێکی دیــاریکراوی تێــدا هــاتووە ‹شـیوەنامـەی ضبط نامهـای خـاص: شـیوەنامەی تۆمـارکردنی ناوگـەلی تایبەت›.

**شیهه** / šeyhe ، ـها/:/اسم. شـهە؛ شـیپە؛ شـیهە؛ هیل؛ هیلە؛ حیلە؛ حیلکە؛ حینە؛ خیـڵە؛ نێخـە؛ نیخە؛ نریخە؛ شیپە؛ هیراهـیرە؛ هـری؛ کـوڕژن؛ دەنگی بە قەوی ئەسپ.

▣ **شیهه کـشیدن:** حیلانـدن؛ شـەهین؛ شـهین؛ هێرین؛ هێرتن؛ هێڕاندن؛ هیرایش؛ هیلنـەی؛ هیلنــای؛ نریخــانن؛ شــریخاندن؛ کووڕانــدن؛ کۆڕانـــدن؛ حیلانـــدن؛ هـــیلانن؛ هیلـــونن؛ هەراکردنی هەسپ ‹تا مرا دید شیهه کشید: هـەتا دیتمی حیلاندی›.

# ص

**ص** / s/: حرف. نیشانەی حەڤدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی کە لە زمانی عەرەبییەوە هاتووە و هەر وەک «س» دەخوێنرێتەوە.

**ص** / se/: اسم. ۱. /مخفف/ ل؛ لاپەڕە ‹ص ۳۵۴: ل ۳۵٤› ۲. /مخفف/ د؛ درودی خودای لێ بێ ‹پیامبر اسلام ص: پێغەمبەری ئیسلام د›.

**صائب** / sā'eb/: [عربی] ☜ **صایب**

**صائم** / sā'em/: [عربی] ☜ **صایم**

**صابر** / sāber ، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. /ادبی/ پڕزوو؛ بەنتم؛ پشوودرێژ؛ بێنفرەھ ؛ بێھن‌فرەھ ؛ بەتاقەت ‹آدم باید در برابر سختیها صابر باشد: مرۆ دەبێ لە ھەمبەر سەختیوە پڕزوو بێت›.

**صابون** / sābûn ، ـھا/: [معرب از لاتینی]/اسم. ساون؛ سابوون؛ ماکێکی پاکەوەکەر لە خوێگەلی سودیوم یا پتاسیوم و ئەسیدگەلی چەور بە شێوەی خۆگر، تراو یان ھەویری کە لە ئاودا کەف دەکا.

▣ **صابون به شکم خود زدن** ☜ شکم خود را صابون زدن، **شکم**

**صابون چیزی/ کسی به تن/ جامەی کسی خوردن**: /مجازی/ لەگەڵ شتێ/ کەسێک سەر و کار ھەبوون و بەتایبەت لێ گەزەنگاز بوون.

**صابونی**[1] / sābûnî/: [معرب]/اسم. ۱. سابوونی؛ سابوونکەر؛ چێکەر یان فرۆشەری سابوون ۲. ئەسپۆنی؛ نێوی ھەر کام لە گیاگەلی وەک سابوون کە خاوێنکەرەوەن و لە ئاودا کەف دەکەن ۳. ☜ **غاسول**

**صابونی**[2]: صفت. سابوونی؛ ساونی: ۱. پێوەندیدار یان ھاوگەر بە سابوونەوە ۲. بەکەفی سابوونەوە تلاو ‹دست صابونی: دەستی سابوونی›.

**صابی** / sābî/: [معرب از آرامی؟]/اسم. سابی: ۱. لە دینگەلی پێشووی ناوچۆمان، کە لایەنگرانی بڕوایان بە ئافرێنەری تاک و تەنیا و پێغەمبەری عازیموون و ھیرمس بووە و حەوتەوانانیان وەک نیشانەی فریشتەکان دەپەرستی ۲. /ـھا؛ ـان/ ھەر کام لە شوێنکەوتوانی ئەو دینە.

**صاحب** / sāheb, sāhab ، ـھا؛ ـان؛ اصحاب/: [عربی] /اسم. خاوەن؛ خاون؛ خاوەند؛ خێو؛ خێوەند؛ خودان؛ خودێ؛ خوێ؛ خۆدێ؛ خوەدی؛ خوەدێ؛ خوەی؛ وەی؛ خویگ؛ ماڵخۆ؛ ماخۆ؛ وایر؛ وایەر؛ ھەیا؛ وەھەر؛ وەندە؛ داژدار؛ ساحێو؛ ساحێب؛ ساو ‹صاحب مال؛ صاحب امتیاز: خاوەن ماڵ؛ خودان سەرپشکی›.

▣ **صاحب داشتن**: خاوەن ھەبوون؛ خاوەندار بوون؛ خێوەند و سەرپەرشت ھەبوون ‹مگر این خانە صاحب ندارد؟: مەگەر ئەم ماڵە

خاوەنی نیە؟›.
**صاحب شدن:** بوونە خاوەن؛ گرتنە دەستەوە؛ هاوردنە ژێر ڕکێف ‹همین‌طور مفت و مسلم خانە را صاحب شد: هەروا خوت و خۆڕایی بوو بە خاوەن ماڵەکە›.
**صاحب‌الزمان**/sāhebozzamān, sāhabozzamān/: [عربی]/اسم./شیعه/ ئیمام زەمان؛ نازناوی ئیمامی دوازدەهەمی شیعەی دوازدەئیمامی.
**صاحب‌جمع** / sāhebcam', sāhabcam/: [عربی] /اسم. ماڵدار؛ کارگێڕێک کە ماڵ و داراییگەلی ڕێخراوەیەکی پێ سپێردراوە.
**صاحبخانە** / sāhebxāne, sāhab-، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. خاوەن‌ماڵ: ۱. خوەماڵ؛ ماڵخوێ؛ ماخۆ؛ ماڵخووی؛ یانەوان؛ ماڵخی؛ خواجە؛ ساحێبی ماڵ ‹شما هم به زودی صاحبخانه می‌شوید: ئێوەش بەم زووانە دەبنە خاوەن‌ماڵ› ۲. خانەخوا؛ خانەخوێ؛ یانەوان ‹صاحبخانه آمده بود اجاره‌ی این ماه را می‌خواست: خاوەن‌ماڵەکە هاتبوو کرێی ئەم مانگەی دەویست› ۳. میواندار ‹صاحبخانه در پذیرایی سنگ‌تمام گذاشت: خاوەن‌ماڵ لە میوانداریدا گاڵەی پێ کرد›.
**صاحبدل** / sāhebdel, sāhab-، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت./مجازی، ادبی/ خاوەن‌دڵ؛ خاوەن گەلێک هەست و ئاگاداری و دڵسۆزی لەمەڕ ژیان، خەڵک و کار و باریاندا.
**صاحب‌سخن** / sāhebsoxan, sāhab-/: [عربی/ فارسی] صفت./ادبی/ وتاربێژ؛ بێژەر؛ وێژەری قسە ‹مستمع صاحب‌سخن را بر سر شوق آورد: بیسەرە وتاربێژ دێنێتە سەر شەوق›.
**صاحب‌عزا** / sāheb'azā, sāhab-، ـها/: [عربی] صفت. ۱. خاوەن‌پرسە؛ بەڕێوەبەری پرسە و سەرەخۆشی ‹صاحب‌عزا خودش در مجلس نبود: خاوەن‌پرسە بۆ خۆی لە کۆڕەکەدا نەبوو› ۲. پرسەدار؛ تازیەبار؛ ئازیەتبار؛ خاوەن مردوو.
**صاحبقران** / sāhebqarān, sāhab-qerān/: [عربی] صفت./کنایی/ بەختەوەر؛ بەختیار؛ خاوەن بەختی بەرز (نازناوێ بۆ پاشایان) ‹سلطان صاحبقران: سوڵتانی بەختەوەر›.
**صاحب‌قلم** / sāhebqalam, sāhab-/: [عربی/ معرب از یونانی] صفت./مجازی/ نووسەر؛ خاوەن لێهاتوویی نووسین.
**صاحب‌کار** / sāhebkār, sāhab-، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. خاوەن‌کار؛ کارفەرما ‹امروز با صاحب‌کار حرفمان شد: ئەمڕۆ لەگەڵ خاوەن‌کارەکە دەمەقرەمان لێ پەیدا بوو›.
**صاحب‌مرده** / sāhebmorde, sāhab-/: [عربی/ فارسی] صفت./تعریض/ دوابڕاو؛ خاوەن‌مردوو؛ خاوەن‌تۆپیو؛ خاوەن‌مردگ؛ بێ‌خاوەن؛ وەی‌مەردە؛ خێربڕیاو، جۆرێ تووک بە واتای ئەی بڕیا خاوەنەکەی دەمرد ‹آن چاقوی صاحب‌مرده را بده به من!: ئەو چەقۆوە خاوەن‌مردووەم بدەیە!›.
**صاحب‌منصب** / sāhebmansab, sāhab-، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. ۱./قدیمی/ ئەفسەر؛ قوماندار؛ زافت ۲. کاربەدەست؛ خاوەن پلە یان پیشەی گرنگ.
**صاحب‌نسق** / sāhebnasaq, sāhab-/: [عربی] صفت. خاوەن‌نەسەق؛ خاوەنی ماف لە زەوینێکدا بە هۆی کارکردن دەوێدا.
**صاحبنظر** / sāhebnazar, sāhab-، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. پسپۆڕ؛ ئاگا و زانا؛ خاوەن بیروڕا؛ بەتایبەت بە بیر و بڕوا و بۆچوون لە بوارێکدا ‹من در سیاست صاحبنظر نیستم: من لە سیاسەتدا پسپۆر نیم›.
**صاد** / sād/: [عربی]/اسم. ساد؛ ناوی حەڤدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.
**صادر** / sāder/: [عربی] صفت. ناردە؛ هەناردە.
⊡ **صادر شدن:** ۱. ناردران؛ هەناریان؛ بەڕێ‌کرانی کالا بۆ جێگایەکی‌تر، بۆ کڕیاران ‹صادر شدن کالا: ناردرانی پیتەوا›

٢. دەرهـاتن؛ دەرچـوون؛ دەرکـران؛ دران؛ دانی فرمـان یـا بـەڕایی کـار لـە لایـەن بەرپرسـێکی فەرمیـەوە (پتـر بـە شـێوەی نووسـراوە) ‹گواهینامـه صـادر شـدن؛ فرمـان صـادر شـدن: گەواهینامـە دەرهـاتن؛ فـەرمان دەرچـوون› ٣. *[ادبـی]* لـێبوونـەوە (زۆرتـر نالـەبار و بـە شـێوەی ناویـستی). هـەروەها: **صادر کردن**

**صـادرات** / sāderāt/: [عربـی] *اسـم.* هـەناردی؛ هـەنارده؛ هنـارتی؛ ناردەمـەنی؛ کـالا یـان خزمەتگەلێک کە لە ناوچـە یـان ولاتێکـەوە بـۆ فـرۆش بـۆ ناوچـە یـان ولاتێکـی دیکـە دەنێردرێ.

**صادراتی** / sāderātî/: [عربی] *صفت.* ناردراوەیی: ١. پێوەندیدار یان هاوگەر بـە هەناردەیـەوە ‹ارز صادراتی: ئەرزی ناردراوەیی› ٢. شیاو بـۆ هـەناردن ‹خرمای صادراتی؛ فرش صادراتی: خورمای ناردراوەیی؛ تەونی هەناردەیی› ٣. ناردراو؛ هەناردراو؛ هەنارتی ‹ارز حاصل از کالاهای صادراتی: ئـەرزی داهـاتوو لـە پیتەوای ناردراو›.

**صـادره** / sādere/: [عربـی] *صـفت.* دەرچـووگ؛ دەرچووو؛ دەرکراو ‹بر حسب دستور صادره از مقام ریاسـت: بـە پێـی فـەرمانی دەرچـوو لـە لایـەن سەرۆکایەتیەوە›.

**صادق** / sādeq/: [عربـی] *صفت. [ادبی]* ١. ڕاستبێژ؛ ڕاستوێژ؛ ڕاستدەر؛ ڕاستگۆ؛ ڕاستۆک؛ قسەڕاست؛ ڕاسواچ ‹او در اظهـاراتش صـادق بـود: لـە قسەکانیدا ڕاسـتبێژ بـوو› ٢. ڕاسـتەکی؛ ڕاسـتەقینە؛ ڕاستەکینە؛ ڕاسـین؛ ڕاسـینە؛ بەڕاسـتی ‹صبح صادق: بەیانی ڕاستەکی›.

**صـادقانه**[1] / sādeqāne/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت. [ادبی]* ڕاستەقینە؛ ڕاستەقانێ؛ ڕاستەکی؛ ڕاسـینە؛ ڕاسی ‹دوستی صادقانه: دۆسی ڕاستەقینە›.

**صادقانه**[2]: *قید.* ڕووتوڕاسـت؛ ڕوتوڕاس؛ ڕاسـت؛ ڕاس؛ ڕاستی؛ بە ڕاستی؛ وە ڕاسی؛ ڕاست و پاک؛ بە شـێوەی ڕاسـت و دروسـتەوە ‹صـادقانه گفت تقصیر من بود: ڕووت و ڕاست گوتی تاوانی من بوو›.

**صـاعقه** / sā'eqe، ـهـا/: [عربـی] *اسـم.* ترێـشقە؛ چەخماخە؛ تەشبریقێ کە بـە هـۆی نزیکـی بـە زەویەوە لە شتێک بدا.

**صاف**[1] / sāf/: [از عربـی] *اسـم.* سـاف: ١. لـووس؛ بێ‌گنج؛ حولی؛ ئەدڵ؛ هلو؛ هللـوو؛ هامـار؛ گـۆڕ؛ گوهۆڕ؛ زەبلـۆق؛ بـێ‌چـرچ و لـۆچ ‹کاغذ صـاف: کاغـەزی لـووس› ٢. زولاڵ؛ بـێ‌خـەوش؛ ڕوون؛ خۆرۆ ‹آب صاف: ئاوی زولاڵ› ٣. سایەقە؛ سا؛ ساو؛ ساف؛ ساماڵ؛ هەساو؛ بـێ‌هـەور (لەمـەڕ هـەواوە) ‹هوای صاف: هەوای سایەقە›.

▣ **صاف کردن:** ١. لووس کـردن؛ سـاف کـردن ٢. ڕێک‌وپێـک‌کـردن؛ تـەکووزکردن ٣. پـاک کردن؛ یەک‌لا کردن؛ تەخت کردن ‹حساب را صاف کردن: پاک‌کردنەوەی حەساب› ٤. پالاوتن؛ پاڵفتن؛ پەرزنەی؛ بە پاڵوێنەداکردن؛ ترهاندن؛ نسلاندن؛ لە سافی دان. هەروەها: **صاف بودن؛ صاف شدن**

**صاف**[2]: *قید. [گفتاری]* ڕاست؛ ڕێک؛ ڕاس؛ تـەخت؛ یەکڕاست؛ یەکڕاس؛ بە شێوەی ڕاستەوخۆ ‹صاف رفت توی مغازه: ڕاست ڕۆیشتە نێو دووکانەکەوە›.

**صـافکار** / sāfkār، ـهـا/: [از عربـی/ فارسـی] *اسـم.* سافکار؛ کەسێ کە کاری سافکاریە.

**صـافکاری** / sāfkārî/: [از عربـی/ فارسـی] *اسـم.* سافکاری: ١. کار و ڕەوتی نەهێـشتنی گنجـی و قوپاوی قاپلۆخی ماشین و وەک ئەوانە ٢. *[ـها]* کارگەی تایبەتی ئەم کارە.

**صـاف‌وسـاده** / sāf-o-sāde/: [از عربـی/ فارسـی] *صفت. [مجازی، گفتـاری]* سـاویلکە؛ بـێ‌ئـەزموونی دڵ‌ساکار ‹تـو هـم عجـب صـاف و سـاده‌ای!: پـەکوو تۆیش چەندە ساویلکەی!›.

**صـاف‌وصـادق** / sāf-o-sādeq/: [از عربـی/ عربـی] *صفت. [گفتاری]* بـێ‌گـەرد؛ بـێ‌گـرێ؛ ڕاسـتبێـژ؛ دروستکار و دڵپاک.

**صــاف‌وصــوف** / sâf-o-sûf/: [از عربــی] *صــفت.* *[گفتــاری]* ســاف‌وســۆڵ؛ لــووس؛ تــه‌کووز و ڕازاوه ‹صورتش را صاف و صوف کرد: ڕوومه‌تی ســاف‌وســۆل کرد›.

**صــافی** / sâfî/: [عربــی] *اســم.* ســافی: ۱. پالــێن؛ پاڵوێن؛ شتێک به ڕووبــه‌ری کــون‌ــکونــه‌وه بــۆ هه‌لاواردنی تراو لــه شــتی خــۆگر ‹صافی چای: پالوێنـــی چـــای› ۲. پالـــوێنکه؛ پالـــوێنه؛ پالـــێوکه؛ ڕاوک؛ پالـــێن؛ په‌رزه‌وانــه؛ پاڕزونــگ؛ تیجــه؛ هه‌یرانۆکــه؛ مــاک یــان شــتێکی تۆــتــۆ (وه‌ک پارچـــه، کاغـــه‌ز، لم یـــان خه‌لـــووز) بـــۆ پـــالاوتنی تـــراو ۳. *[بـــرق]* ئامێرێـــک بـــۆ جیاکردنـــه‌وه‌ی ڕه‌وتی کاره‌بـــا بـــه پێـــی فریکانـــسیان ٤. *[نورشناسـی]* فیلتـر؛ که‌ره‌ســـته یان شتێکی نیـوه‌ڕوون کـه به‌شـێ لـه تیشکی لــێدراو وه‌خــۆ ده‌گــرێ ٥. لووســی؛ دۆخ یــان چۆنیه‌تی ساف و لووس بوون.

**صـــالح** / sâleh، ـان؛ ـیـن/: [عربـــی] *صـــفت.* گونجـاو؛ چـاک؛ چـاک‌وپـاک؛ خـاس؛ خـاوه‌ن لێهـاتوویی و شـیاوی ‹نماینـده‌ی صـالح: نوێنــه‌ری گونجاو›.

**صامت** / sâmet/: [عربی] *صفت.* بێ‌ده‌نـگ؛ کـپ ‹نشسته بود و داشت یکی از فیلمهـای صـامت را تماشا می‌کرد: دانیشتبوو یـه‌کێ لـه فیلمـه بـێ‌ده‌نگـه‌کانی سه‌یر ده‌کرد›.

**صــانع** / sâne'/: [عربــی] *اســم.* *[ادبــی]* ئافرێنــه‌ر؛ خولقێنـه‌ر؛ چێکـر؛ دروسـت‌کـه‌ر؛ درووسـکه‌ر: ۱. ســـازێنه‌ری شـــتێک ۲. به‌دیهێنـــــه‌ری شتێک.

**صایب** / sâyeb/: [عربی] *صفت.* *[ادبـی]* بـه‌جێ؛ بـه هه‌تەر یان کاردانه‌وه‌یه‌کی ڕاست و دروست ‹رأی صـایب؛ نظـر صـایب: ڕای بـه‌جێ؛ تێبـینی بـه‌جێ›: **صائب**

**صـــایم** / sâyem/: [عربـــی] *صـــفت.* *[ادبـــی]* ڕۆژوو؛ به‌ڕۆژوو؛ ڕۆژگ؛ ڕۆژگـه‌وان؛ ڕۆژه‌وان؛ ڕۆژیـه‌وان؛ ڕۆچه‌وان: **صائم**

**صبا** / sabâ/: [عربی] *اسم.* ۱. سروه؛ بایه‌ک که لـه باکووری ڕۆژهه‌لاته‌وه ده‌شنێ ۲. شه‌ماڵ؛ شـنه؛ شنه‌با؛ نه‌رمه‌با؛ بای فێنک و خۆش.

**صــباح** / sabâh/: [عربــی] *اسـم.* *[گفتــاری]* ڕۆژ؛ ڕۆ؛ ڕۆج؛ ڕۆچ؛ ڕووژ ‹چهار صباح کار می‌کند، زود دلش را مــی‌زنــد: چــوار ڕۆژ کــار ده‌کــا، زوو دلــی لــێ هه‌لده‌که‌وێ›.

**صباحت** / sabâhat/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* جـوانی؛ خۆشـــیکی؛ قـــه‌نجی؛ قـــۆزی؛ قه‌شـــه‌نگی؛ جوان‌خاسی؛ خوجوانی؛ جوان‌چاکی.

**صباغ** / sabbâq، ـها؛ ـان/: [عربـی] *اسـم.* *[قـدیمی]* خـــومچی؛ خمچـــی؛ خومخانـــه‌چی؛ خمگـــه‌ر؛ ڕه‌نگرێژ؛ گازرکار.

**صباوت** / sabâvat/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* مندالـی؛ منالی؛ زاوله‌یی؛ زارۆله‌یی؛ زارۆیی.

**صبح**[1] / sobh، ـها/: [عربـی] *اسـم.* بـه‌یانی؛ سـۆ؛ سه‌وا؛ سوا؛ سب: ۱. شه‌وه‌کی؛ کاتی ده‌سـپێکی ڕۆژ ‹صبح شده بـود، خورشید داشت طلوع مـی‌کـرد: بــه‌یانی ببــوو، خــۆر خــه‌ریک بــوو هه‌لــده‌هات› ۲. شه‌وه‌کی؛ ساعب؛ سه‌با؛ سوا؛ هــه‌وه‌ڵ به‌شـی ڕۆژ ‹ساعت ۱۰ صبح به دیـدنش رفـتم: کـاتژمێر ۱۰ی به‌یانی چووم بۆ دیتنی›.

▣ **صــبح زود/ ســحر**: بــه‌یانی زوو؛ سه‌رســۆ؛ مه‌لابانگــدان؛ بــه‌ره‌بانگ؛ شــه‌وه‌کی؛ گه‌ڤــل؛ سه‌ره‌تای سۆ.

**صبح صادق**: به‌ره‌به‌یانی؛ به‌ره‌بـه‌یان؛ سـه‌ر لـه به‌یانی؛ کاتی بـه‌یانی کـه هێـلێکی سـپی لـه ئاسۆوه دیار ده‌بێ و په‌ره ده‌ستێنێ.

**صبح کاذب**: کازێوه؛ کازیوه؛ کـازوکوز؛ کاتـێ له شه‌و که ڕووناکیـه‌کی کـه‌م بـۆ ماوه‌یـه‌کی کورت له ئاسۆی ڕۆژهه‌لاتیه‌وه ده‌رده‌کـه‌وێ و پاشان لاده‌چێ.

**صبح**[2]: *قید.* به‌یانی؛ شـه‌وه‌کی؛ سه‌رسـۆ؛ سـۆحا؛ سه‌بای؛ سه‌به‌ی؛ له سـه‌ره‌تای ڕۆژدا ‹صبح رفتم

اداره: بەیانی چوومە مەزرینگە›.

**صبحانه** / sobhāne/: [عربی/ فارسی]/اسم. چاشتا؛ ناشتا؛ بەرچایی؛ تاشت؛ ژێرقلیان؛ بەرقلیان؛ تاشتی؛ قاوەتی؛ قووالتی؛ زیرقەلوو؛ تێشت؛ سوبحانە؛ خواردەمەنیەک کە لە کاتی بەیاندا دەخورێ.

**صبح به خیر** / sob(h)bexeyr/: [عربی/ فارسی/ عربی] دعا. بەیانی باش؛ سواخەیر؛ سەباخەیر؛ سەواخەیر؛ ڕێز وشەیێ کە بەیانیان کاتی پێکگەیشتن دەگوترێ، واتا هیوادارم بەیانی بە خۆشی دەست پێبکەی ‹سلام کردم و صبح‌به‌خیر گفتم، کسی جوابم را نداد: سەلامم کرد و بەیانی‌باشم گوت، کەس لێمی نەسەندەوە›.

**صبحدم**[1] / sobhdam/: [عربی/ فارسی]/اسم. /ادبی/ ۱. بەربەیان؛ بەیانی ۲. بەیانەکی؛ گەڤل؛ بەیانی زوو؛ سەرسۆ؛ سەرەتای بەیانی.

**صبحدم**[2]: قید. /ادبی/ دەمەوبەیان؛ بەرەبەیان؛ شەوەکی؛ لە کاتی بەیانیدا.

**صبحگاه** / sobhgāh ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. بەرەبەیان؛ شەوەکی؛ کاتی بەیانی.

**صبحگاهان** / sobhgāhān/: [عربی/ فارسی] قید. بەیانی؛ سەر لە بەیانی؛ بەرەبەیان؛ بەیانیان؛ دەمدەمانی بەیانی.

**صبحگاهی** / sobhgāhî/: [عربی/ فارسی] صفت. بەیانیان؛ سەر لە بەیانیان؛ پێوەندیدار یان سەر بە سبحەوە ‹ورزش صبحگاهی: وەرزشی بەیانیان›.

**صبر** / sabr/: [عربی]/اسم. ۱. سەور؛ سەبر؛ کاری ڕاوەستان؛ وەستان و چاوەڕوانی تا کاتی شیاو ‹صبر کردم تا هوا کاملاً روشن شود: ڕاوەستام تا هەوا تەواو ڕوون بێتەوە› ۲. سەور؛ سەبر؛ نتم؛ پشوودرێژی؛ پشوو لەسەرخۆیی؛ خۆڕاگری؛ بێن‌فرەهی؛ پرزوویی؛ پرزەداری؛ تەوات؛ تەوتین؛ دایاخ ‹صبر کن بزودی دردش ساکت می‌شود: سەورت هەبێ زوو ئێشەکەی دەسرەوێ› ۳. /فرهنگ‌مردم/ سەبر؛ سەور؛ یەک پژمە؛ بەرامبەر: جەخت ۴. قالی‌شاری؛ تالی‌شاری؛ هەزاوا؛ عەزاوا؛ ئەزوا؛ هەزوا؛ عەزوا؛ مور؛ گیایەکی سەلکداری گەلائەستووری قەراخ دڕکاویە، شیراوەیەکی تالی لێ دەردێ کە بۆ دەرمان دەشێ.

◙ **صبر ایوب**: /کنایی/ سەبری ئەیووب؛ تاقەت و پشوودرێژی زۆر.

▣ **صبر آمدن**: سەبر هاتن؛ سەور هاتن؛ لە کاتی ئەنجامی کارێک، لە نەکاو تاقە پژمەیەک کردن (زۆرێک لەو کاتەدا یا کارەکە ناکەن یان ماوەیەک دەست ڕادەگرن) ‹خواستم بروم صبر آمد: ویستم بڕۆم سەبر هات›.

**صبر داشتن**: سەبر هەبوون؛ پشوودرێژ بوون؛ بە تاقەت بوون؛ پرزوو بوون؛ دەرهەڵ نەبوون ‹کمی صبر داشته باش، خوب می‌شود: تۆزێ سەبرت هەبێ، چا دەبێ›.

**صبر کردن**: ڕاوەستان؛ وێسان؛ وێسیان؛ خۆگرتن؛ سەبر/ سەور کردن.

**صبر کسی به سر آمدن**: /ادبی/ تاقەتی کەسێک بڕان؛ ئۆقرە بۆ کەسێ نەمان؛ چی‌دی لەسەر ئەو دۆخە نەوەستان ‹صبرم به سر آمد، فریاد زدم و با مشت به در کوفتم: تاقەتم بڕا، هاوارم کرد و بە مشت لە دەرکەم دا›.

**صبرزرد** / sabrezard/: [عربی/ فارسی]/اسم. هەزاوا؛ عەزاوا؛ مۆر؛ تالیشاری؛ ژەقنەمووت ۱. /ـها/ گیایەکی تایبەتی ناوچەی گەرمیان، بە گەلای ئەستوور و کەتیرەدارەوە ۲. ناوی کەتیرەی گەلای ئەو گیایە.

**صبغه** / sebqe/: [عربی]/اسم. /ادبی/ بار؛ بۆن؛ تام؛ ڕەنگ ‹سخنانش اندکی صبغه‌ی تعصب داشت: وتەکانی تۆزێک بۆنی ڕکەی پێوەبوو›.

**صبور** / sabûr/: [عربی] صفت. /ادبی/ پرزوو؛

بەبڕست؛ بە تابشت؛ بە تاقەت؛ پشوو لەسەرخۆ؛ بێنفرەھ ؛ نەرموو؛ سەرەخۆ؛ کاوەخۆ؛ خۆڕاگر؛ بە گیر.

**صبوری** / sabûrî، ـھا/: [عربی]/اسم. /ادبی/ پرزوویی؛ بە برستی؛ پشووولەسەرخۆیی؛ بێنفرەھی؛ سەرەخۆیی؛ کاوەخۆیی؛ سەبووری؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەتاقەت و پشوودرێژ بوون.

**صبه** / sobbe/: [عربی] ☜ **مندایی-۱**

**صبیه** / sabîy(y)e، ـھا/: [عربی]/اسم. /ادبی/ ۱. /نامتداول/ کیژۆلە؛ کچۆلە؛ کناچلێ؛ کچی کەمتەمەن و منداڵکار ۲. کچ؛ کەنیشک؛ کناچێ؛ کچکا؛ دویت؛ دۆت؛ دۆتە؛ منداڵی مێوینەی کەسێک ‹این خانم صبیەی شماست؟: ئەم خانمە کچی ئێوەیە؟›.

**صحابه** / sahābe/: [عربی] ۱. جمعِ ☜ **صحابی** ۲. ☜ اصحاب رسول الله، **اصحاب**

**صحابی** / sahābî، صحابه؛ اصحاب/: [عربی]/اسم. سەحابی؛ یاران؛ هەر کام لەو کەسانەی کە لە سەردەمی پێغەمبەری ئیسلام، ئیمانیان پێهێنا و لە بەر دەستی بوون و ئەویش لەگەڵیان ڕاوێژی دەکرد.

**صحاری** / sahārî/: [عربی] جمعِ ☜ **صحرا**

**صحاف** / sahhāf، ـھا؛ ـان/: [عربی]/اسم. جزوبەند؛ کەسێ کە کاری جزوبەندیە.

**صحافی** / sahhāfî/: [عربی]/اسم. جزوبەندی: ۱. کار و ڕەوتی دەستەکردن، برین، چەسپاندن، دوورین و بەرگگرتنی پەڕەی کاغەز بۆ دروستکردنی دەفتەر و کتێب ‹جلد کتاب پارە شدە، باید صحافی شود: بەرگی کتێبەکە دڕاوە، دەبێ جزوبەندی بکرێ›. هەروەها: **صحافی‌شدن؛ صحافی‌کردن** ۲. /ـھا/ کارگەی جزوبەندی ‹بردم صحافی گفتند یک هفتە کار دارد: بردم بۆ جزوبەندی، گوتیان حەفتەیەک کاری هەیە›.

**صحبت** / sohbat، ـھا/: [عربی]/اسم. قسە؛ وتوویژ؛ وتە؛ گوتە؛ بێژە: ۱. کار یان ڕەوتی قسەکردن، بەتایبەت ئاخاوتنی چەن کەس پێکەوە ‹صحبت کردن: قسەکردن› ۲. باس؛ قسە و باس؛ گوڕ؛ بابەتی قسە لێکراو ‹صحبت بر سر پول است: قسە لەسەر پارەیە›.

▣ **صحبت به میان آمدن:** قسە هاتنە ئاراوە؛ قسە لێکران؛ وتوویژ لەمەڕ شتێکەوە کران ‹صحبت کتاب به میان آمد همه فریادشان بلند شد: قسەی کتێب هاتە ئاراوە، هەموو دەنگیان بەرزەوە بوو›.

هەروەها: **صحبت به میان آوردن**

**صحبت چیزی/ کسی بودن:** قسەی شتێ/ کەسێک بوون؛ باسی شتێ/ کەسێک بوون؛ لەمەڕ شتێ یان کەسێکەوە ئاخاڤتن ‹صحبت انتخابات بود، هر کسی چیزی می‌گفت: باسی هەڵبژاردن بوو، هەر کەسێ شتێکی دەگوت›.

هەروەها: **صحبت چیزی/ کسی شدن**

**صحبت شدن:** قسەکران؛ باسکران؛ وتوویژ بوون ‹دربارەی کار تو هم صحبت شد: لە مەڕ کاری تۆشەوە قسەکرا›.

**صحبت کردن:** قسەکردن؛ قسە/ قسێ کەردەی: ۱. باسکردن؛ وتوویژکردن ‹از خاطرات مدرسه صحبت کردیم: لە بیرەوەریەکانی قوتابخانە قسەمان کرد› ۲. پەیڤین؛ دوان ‹اصلاً با من صحبت نکرد: لەگەڵ مندا هیچ قسەی نەکرد›.

**صحت** / sehhat/: [عربی]/اسم. ۱. ڕاستی؛ ڕاسی؛ دروستی؛ درووسی؛ پاکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕاست و دروست بوون ۲. تەندروستی؛ لەشساغی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەلامەت بوون.

▣ **صحت آب گرم:** عافیەت؛ ڕێز وشەی لە حەمام هاتنە دەر، واتا «بە هیوای لەشساغی پاش حەمامکردنت».

**صحت خواب:** سێحەتی خەو؛ سەحەت خەو؛ ڕێز وشەی لە خەو هەستانەوە، بە واتای

«هیوادارم خەو ساغی بۆت هێنابێ».

**صحت وسقم** / sehhat-o-soqm/: [عربی] اسم. ڕاست و درۆ؛ دروست یان نادروست بوونی بابەتێک ‹من از صحت‌وسقم موضوع چیزی نمی‌دانم: من لە ڕاست و دروی بابەتەکە شتێک نازانم›.

**صحرا** / sahrā، ـها؛ صحاری/: [عربی] اسم. بیاوان؛ بیابان؛ بێروون؛ ڕووتەن؛ دەشت: ۱. چۆڵ؛ چۆل؛ چۆلگە؛ قووزی؛ سارا؛ وشکارۆ؛ گەوەر ۲. دەر؛ دەرەوەی دەڤەری تێدا ژیان.

▣ **صحرای کربلا**: *[کنایی]* بیاوان؛ جێگای دوور لە ئاو و ئاوەدانی ‹بابا تو ما را آوردی گردش یا صحرای کربلا؟: ئەرێ کاکە تۆ ئێمەت هێناوە بۆسەیران یان بیاوان؟›.

**صحرای محشر**: *[اسلام]* مەیدانی مەحشەر؛ سارای مەحشەر؛ بیاوانێکی پان و بەرین کە دەڵێن لە ڕۆژی مەحشەردا هەموو خەڵکی بۆ پێڕاگەیشتن بە کاری دنیایان تێیدا کۆ دەکەنەوە.

▣ **به صحرای کربلا زدن**: *[مجازی]* کردنە باسی کەر و تێرەکە/ بەرەبۆر؛ بابەتی وت‌وویژگۆڕان و قسەی خۆکردن ‹بعد از آن زد به صحرای کربلا و مسئلەی عزب بودنش را پیش کشید: پاش ئەوە کردیە باسی کەر و تێرەکە و قسەی سەڵت بوونی خۆی هێنایە ئاراوە›.

**صحرائی** / sahrā'î/: [عربی] ☜ **صحرایی**

**صحراگرد** / sahrāgard، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. بیاوانگەڕ؛ هەردەگێڵ؛ بە هۆگرەتی و خوو و خدەی بیابانگەڕیەوە. هەروەها: **صحراگردی**

**صحرانشین** / sahrānešîn، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. سارانشین: ۱. بیاوانگەڕ؛ هەردەگێڵ ۲. کۆچەر؛ دەشتەکی؛ چۆڵپەرست؛ چۆڵنشین؛ چۆلەمەن ۳. *[کنایی]* دێهاتی؛ لادێیی.

**صحرانورد** / sahrānavard، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. چۆڵەوان؛ بیاوانگەڕ؛ هەردەگێڵ؛ بە هۆگرەتی و خووی بیاوانگەردیەوە.

**صحرانوردی** / sahrānavardî، ـها/: [عربی] اسم. چۆڵەوانی؛ بیاوانگەڕی؛ هەردەگێڵی؛ کار یان ڕەوتی ڕێگە چوون لە دەشت و سارادا.

**صحرایی** / sahrāyî، ـها/: [عربی] صفت. ۱. سارایی؛ دەشتەکی؛ پێوەندیدار یان سەر بە بیاوان ‹آب و هوای صحرایی: ئاو و هەوای سارایی› ۲. *[مجازی]* خۆڕسک؛ خۆڕست؛ خۆوەر؛ خۆدەر ‹گل صحرایی: گوڵی خۆڕسک› ✽ **صحرائی**

**صحف** / sohof/: [عربی] جمعِ ☜ **صَحیفه**

**صحن** / sahn، ـها/: [عربی] اسم. ۱. نێوگۆڕک؛ ناوگۆڕک؛ گۆڕک؛ گۆڕکە ‹صحن مجلس؛ صحن دادگاه: نیوگورکی کۆڕ؛ گورکی دادگا› ۲. نێوگۆڕک؛ ناوگۆڕک؛ حەوشەی بینای ئایینی ‹صحن مسجد: ناوگورکی مزگەوت› ۳. *[ادبی]* گۆڕەپان؛ تەختایی؛ پانایی؛ ڕاستایی؛ جێگەی بەربلاو ‹صحن باغ؛ صحن چمن: گورەپانی باخ؛ تەختایی چیمەن›.

**صحنه** / sahne، ـها/: [عربی] اسم. ۱. شانۆ؛ نیار؛ پەهنەک؛ جێگایەک لە پێشەوەی تەلاری نومایش کە لە ڕووبەری زەوی بەرزترە و ئەکتەرەکان لەوێ کایە دەکەن ‹صحنەی نمایش: شانوی نومایش› ۲. شانۆ؛ وەها جێگایەک لە تەلاری مووسیقادا ۳. شانۆ؛ جێگەی بەرزی ناوەڕاستی سیرک ٤. گۆڕ؛ ناوگۆڕ؛ پەردە؛ بەشێ لە پەردەی شانۆ کە کەسانێک کاری تێدا دەکەن ٥. دیمەن؛ ڕوانگەیەکی ڕاستەکی یان خەیاڵی کە ڕووداوێک نیشان دەدا ‹پلیس برای تشریح حادثه، صحنەی قتل را بازسازی کرد: پولیس بۆ ڕاڤەکردنی کارەساتەکە، دیمەنی قەتڵەکەی دروست کردەوە› ٦. *[کنایی]* مەیدان؛ گۆڕەپان؛ جێگای هاتنە دیاری کار یان ڕووداوێک ‹صحنەی جنگ؛ صحنەی سیاست: گورەپانی شەڕ؛ مەیدانی سیاسەت›.

▣ **به/ روی صحنه آمدن**: ۱. هاتنە سەر شانۆ؛ نومایش دران ‹هاملت به صحنه آمد: هاملیت هاتە

سەر شانۆ› ۲. *[کنایی]* هاتنە پێشەوە؛ هاتنە ئاراوە؛ هاتنە کایەوە؛ وە پێش هاتن و کار یان چالاکی‌کردن ‹در همین هنگام دکتر مصدق به صحنه آمد و مردم را علیه قرارداد نفت شوراند: هەر لەم کاتەدا دوکتور موسەدیق هاتە کایەوە و خەڵکی دژ بە بڕیارنامەی نەوت هەڵخڕاند›. هەروەها: **به/ روی صحنه آوردن/ بردن؛ به/ روی صحنه رفتن**

**در صحنه بودن:** ۱. لە سەر شانۆ بوون؛ لە کاتی نومایش بوون ‹هنرپیشه‌ی اول هنوز در صحنه است: ئەکتەری هەوەڵ هێشتا لە سەر شانۆیە› ۲. *[کنایی]* لە سەر هەست بوون ‹اگر مردم در صحنه باشند کار به کودتا نمی‌کشد: ئەگەر خەڵک لە سەر هەست بن ئەنجامی کارەکە نابێتە کودەتا›.

**صحنه‌آرا** / sahneārā, -'ārā ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* شانۆڕازێن؛ کەسێ کە کاری شانۆتەوزێنیە.

**صحنه‌آرایی** / sahneārāyî, -'ārāyî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* شانۆڕازێنی؛ شانۆتەوزێنی؛ کار و ڕەوتی ڕازاندنەوەی شانۆی نومایش یان فیلم، وەک دانانی ئامێری پێویست لە جێی شیاودا.

**صحنه‌سازی** / sahneîsāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کاری وەدی‌هێنانی بار و دۆخێکی ناڕاست و درۆینە وەک شانۆی نومایش بۆ خەڵەتاندنی خەڵکی.

**صحنه‌گردان** / sahnegardān ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ۱. منشی صحنه ☜ **منشی** ۲. *[مجازی]* شانۆگێڕ؛ بەڕێوەبەری ڕەوتێکی نمایشی یان کارێکی (زۆرتر) نەشیاو ‹آن سال او صحنه‌گردان انتخابات بود: ئەو ساڵە ئەو شانۆگێڕی هەڵبژاردنەکان بوو›.

**صحه** / sehhe/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. واژۆ؛ نیشان؛ ئیمزا ‹نامه را به صحه‌ی ایشان رساندم: نامەکەم دا واژۆیان کرد› ۲. پەسند؛ کار یان ڕەوتی چەسپاندن؛ ئەرێ لێدان؛ گەواهی دان لە سەر ڕاستی شت یان بابەتێک.

▣ **صحه گذاشتن:** ۱. واژۆکردن؛ ئیمزاکردن ۲. پەسند کردن؛ گەواهی دان؛ شایەتی دان؛ باوەڕ پێ کردن.

**صحی** / sehhî/: [عربی] *صفت. [قدیمی]* تەندروستی؛ ساغی؛ ساقی.

**صحیح** / sahîh/: [عربی] *صفت.* دروست؛ درووس؛ ڕاستەکی؛ دوغری؛ بێ‌لاری و خواری ‹فرمایش شما صحیح است: فەرمایشەکەتان دروستە›.

**صحیح وسالم** / sahîh-o-sālem/: [عربی] *صفت.* ساق‌وسەلیم: ۱. ساغ؛ تەندروست؛ لەش‌ساغ ‹صحیح‌وسالم در برابرتان نشسته‌ام: ساق‌وسەلیم لە بەرامبەرتانەوە دانیشتووم› ۲. بێ‌کەمایەسی؛ بێ‌کەم و کورتی ‹این ساعت صحیح‌وسالم است و دارد کار می‌کند: ئەم کاتژمێرە ساق‌وسەلیمە و کار دەکا›.

**صحیفه** / sahîfe ، ـها؛ صُحُف/: [عربی] *اسم. [ادبی]* کتێب؛ پەرتووک.

**صخره** / saxre ، ـها/: [عربی] *اسم.* گاشە؛ گاشەبەرد؛ گابەرد؛ تاش؛ هێژک؛ کەت؛ کەفر؛ کەڤر؛ قەف؛ زاخۆر؛ ڕاز؛ زنار؛ ساغوورەک؛ کەمەرە؛ کەمور؛ کەنەک؛ تیشە؛ شاخ؛ ماوەزەرد؛ بەردی ڕژد و بڵند.

**صخره‌نورد** / saxrenavard ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ڕازەوان؛ شاخەوان؛ کەسێ کە بە شاخاندا هەڵدەچێ.

**صد**[1] / sad ، ـها/: *اسم.* سەد؛ سەت: ۱. ژمارەی سەرەکی پاش نەوەد و نۆ، پێش سەد و یەک ۲. *[مجازی]* چەندیەتیەکی یەکجار زۆر ‹صد بار اگر توبه شکستی، بازآ !: سەد جاریش تۆبەت شکاند، هەر وەرەوە!›.

▣ **صد تا یک غاز:** *[مجازی]* سەلکە پیاز؛ گەڵا چۆنەر؛ بەرگی چەوەندەر؛ پووش؛ مەراش؛ کاپەڕش؛ تەڕەتۆڵە؛ دزگین؛ شتی بێ‌بایەخ و هیچ‌وپووچ ‹این حرفهای صد تا یک غاز به چه درد

من می‌خورد؟: ئەم قسە سەلکە بیازانە بە کاری چیم دێن؟›.

**صد در صد:** سەتاسەت؛ سەدی سەد؛ سەد و سەد؛ سەد لە سەد؛ تەواو؛ پاک ‹صد در صد درست است: سەتاسەت دروستە›.

**صد دینار** ☜ **صددیناری**

**صد سال سیاه:** */مجازی/* هەرگیزای هەرگیز؛ قەت‌ـقەت؛ هەزار ساڵ؛ هیچ کاتێک ‹صد سال سیاه این کار را نمی‌کنم: هەرگیزای هەرگیز ئەم کارە ناکەم›.

▣ **صد تا کفن پوساندن:** */مجازی/* پێشە بوونە خاک؛ ئێسک و پرووسک پوان؛ پێشە پوترکیان؛ پێشێ نەمەنەی؛ سەد جار مردن؛ زۆر لە مێژەوە مردن ‹او تا حالا صد تا کفن پوسانده: تا ئێستە پیشەی بووەتە خاک›.

**صد**[۲]: *صفت.* سەد؛ سەت: ۱. یەکێ زۆرتر لە نەوەد و نۆ دانە ۲. سەدەم؛ سەدەمین ‹من نفر صدم بودم: من سەدەم کەس بووم›.

**صدا** / sedā, sadā ، ـها/: [عربی]/اسم. دەنگ؛ دنگ؛ دەنگە؛ سەدا: ۱. ئەوەی کە دەبیسرێ ‹چه صدایی بود؟: چ دەنگێک بوو؟› ۲. هەستێ کە لە دەزگای ژنەوایەوە بەدی‌دێ ‹گوشم صدا می‌کند: گوێم دەنگ دەداتەوە› ۳. */فیزیک/* هەستێ کە بە هۆی کارکردنی پەردەی گوێی مرۆ بە هۆی لەرانەوەی هەوا بە فریکانسی ۲۰ تا ۲۰۰۰۰ هیرتز بەدی‌دێت ٤. هاتوچۆی میکانیکی ئامێرێک یان لەرەی بەشێک لە جەستەی گیانەوەرێ (وەک ژێی دەنگی)، کە ببیسرێت ٥. هەر کام لەو نیشانە و پیتانەی ئەلفوبێتکە کە لە کاتی دەربڕینیان لێو نابەسرێن و زمان بە دەم و ددانەوە نالکێ (وەک: ئـا، ئـە ؛ ئـۆ) ٦. */مجازی/* گازی؛ گاسی؛ هاوار؛ قاوی بەرز، بەتایبەت بۆ بەرهەڵستی ‹آخر صدای مردم درآمد: ئاخری دەنگی خەڵکی دەرهات› ۷. */مجازی/* چۆنیەتی دەنگ ‹صدای خوبی دارد: دەنگێکی چاکی هەیە› ۸. */مجازی/* تۆڕی هەناردنی فریکانسی ڕادیۆیی ‹صدای ایران؛ صدای آمریکا: دەنگی ئێران؛ دەنگی ئەمریکا›.

▣ **صدای بلند:** دەنگی بەرز؛ دەنگی بەقەو؛ دەنگێک بە هێز و تیژی زۆرەوە کە چاک ببیسرێ.

**صدای بم:** دەنگی گڕ؛ دەنگێک بە فریکانسی کەمەوە (وەک دەنگی دەهۆڵ یان پیاو).

**صدای تیز:** دەنگی زیق؛ دەنگی زیقاوڵ؛ دەنگی بەرز و تیژ.

**صدای خفه:** دەنگی کپ؛ دەنگی کەم فریکانس و بێ‌ئاواز.

**صدای دو رگه:** دەنگی دووڕەگە؛ دەنگی نێر؛ دەنگی تێکەڵ لە دەنگی کوڕی مێرمنداڵ و پیاو (وەک دەنگی کوڕی تازەپێگەیشتوو).

**صدای زیر:** دەنگی زیل؛ دەنگی زیک؛ دەنگی تیژ؛ دەنگ بە فریکانسی زۆرەوە (وەک دەنگی زارۆ یان زۆرێک لە گۆرانی‌بێژانی ژن).

**صدای کلفت:** */گفتاری/* دەنگی گڕ؛ دەنگێک بە فریکانسی کەمەوە (لەمەڕ مرۆوە).

**صدای مخملی:** */مجازی/* دەنگی ساف؛ دەنگی نەرم؛ دەنگی خۆش و دڵنشین.

**صدای نازک:** */گفتاری/* دەنگی زیل؛ دەنگ بە فریکانسی زۆرەوە (لەمەڕ مرۆوە).

▣ **صدا بلند شدن:** دەنگ بەرزەوە بوون: ۱. دەنگ بەدیهاتن ‹صدای اذان بلند شد: دەنگی بانگ بەرزەوە بوو› ۲. بوونە قاڵ؛ بوون بە قرموقاڵ؛ هەرا و هوریا هەڵسان ‹ناگهان توی کوچه صدا بلند شد: لە نەکاو لە کۆڵانەوە بوو بە قاڵ›.

**صدا به صدا نرسیدن:** زەنا‌ـ زەنا بوون؛ دەنگ گوم بوون ‹توی آن شلوغی صدا به صدا نمی‌رسید: لەو هەرا و هوریایەدا دەنگ گوم دەبوو›.

**صدا دادن:** دەنگ دانەوە؛ دەنگ لێ بەرزبوونەوە؛ دەنگ بەدیهێنان ‹وقتی بمب

منفجر می‌شد، نمی‌دانی چه صدایی می‌داد!: کاتێ کە بومب دەتەقایەوە، نازانی چ دەنگێکی دەدایەوە!›.
**صدا درآوردن**: دەنگ دەرهێنان؛ دەنگ دەرهاوردن؛ بوونە هۆی بەدیهاتنی دەنگ ‹از خودش صداهای عجیب درمی‌آورد: دەنگی سەیری لە خۆوە دەردینا›.
**صدا زدن**: بانگ کردن؛ گازی کردن؛ گاسی کرن؛ قاوکردن؛ چڕین؛ چڕیەی ‹برادرم را صدا زدم، جواب نداد: براکەمم بانگ کرد، وەلامی نەداوە›.
**صدا کردن**: ١. بانگ‌کردن؛ گازی کردن؛ قاو کردن؛ چڕین ‹تاکسی صدا کردم: تاکسیم بانگ کرد› ٢. دەنگ دانەوە؛ دەنگ لێ‌هاتن؛ دەنگ دەرهاتن؛ دەنگەوەدەی ‹سینی از دستم افتاد بدجوری صدا کرد: سینیەکە لە دەستم داکەوت خراپ دەنگی‌دایەوە› ٣. *[مجازی]* دەنگ دانەوە؛ دەنگەوە دەی؛ بوونە هۆی سەرنج ڕاکێشان و وت‌وویژی خەڵکی ‹کارش خیلی صدا کرد: کارەکەی زۆر دەنگی دایەوە›.
**صدای چیزی را درنیاوردن**: *[مجازی]* پا بەسەردا ساوین؛ دەنگی شتێ دەرنەهێنان؛ بان چتێک نیانەوە؛ لە بارەی شتێکەوە هیچ بە کەسێک نەگوتن ‹پول آزاد را خورد و صدایش را هم در نیاورد: پارەی ئازادی خوارد و پاشی بەسەردا ساوی›.
**صدای کسی از ته چاه درآمدن**: *[کنایی]* بەحاڵ نووزەی کەسێ دەرهاتن؛ میزەی کەسێ هاتن؛ دەنگ ژار کەسێ هاتن؛ دەنگی کەسێک زۆر کز و لاواز بوون.
**صدای کسی از جای گرم درآمدن**: *[کنایی]* هەناسەی کەسێ لە جێگای گەرمەوە هاتنە دەر؛ هەناسەی کەسێ گەرم بوون؛ لە گیر و گرفت بێ‌خەبەر بوون ‹تو هم صدایت از جای گرم درمی‌آید، من پول برای این طور چیزها از کجا بیاورم؟: تۆیش هەناسەت لە جێگەی گەرمەوە دێتە دەرەوە، من پارەی ئەم شتانەم لە کوێ بوو؟›.
**صدای کسی درنیامدن**: دەنگی کەسێک دەرنەهاتن: ١. هیچ نەگوتن ٢. *[کنایی]* بەرهەڵستی نەکردن ‹چرا با این‌همه ظلم صدای کسی درنمی‌آید: بۆچی بەم هەموو ناحەقیە دەنگی کەس دەرنایەت›.
**صدای کسی را درآوردن**: *[مجازی]* دەنگی کەسێک دەرهێنان؛ دەنگ کەسێ دەرهاوردن؛ کەسێ وەڕەزکردن؛ بوونە هۆی تووڕەیی و بەرهەڵستی کەسێک ‹صد دفعه گفتم صدای من را در نیار: سەد جارم پێ‌گوتی دەنگم دەرمەهێنە›.
**صدای کسی گرفتن**: دەنگی کەسێک نووسان؛ دەنگی کەسێ گیران؛ دەنگوو یۆی گیریەی؛ بە هۆی ماندوویەتی یان نەخۆشی، دەنگی کەسێک باش دەرنەهاتن ‹چرا صدایت گرفته؟: بۆچی دەنگت نووساوە؟›.
**به صدا درآمدن**: هاتنە دەنگ؛ دەنگ لێوە هاتن؛ دەنگی شتێک بیسران ‹رأس ساعت ١٢، ناقوس به صدا درآمد: لەسەر کاتژمێری ١٢، ناقووسەکە هاتە دەنگ›.
**ـ صدائی** / sedā'î/: [عربی] ☜ **صدایی**
**صدابر** / sedābar/: [عربی/ فارسی]/اسم/ دەنگ‌بەرە؛ دەنگ‌بەر؛ میکرۆفون.
**صدابرداری** / sedābardārî/: [عربی/ فارسی]/اسم/ کار یان ڕەوتی تۆمارکردن؛ تۆماری دەنگەلی بەرنامەیەک (وەک: فیلم، نومایشی ڕادیۆیی، بەرنامەی تەلەڤیزیۆن و...). هەروەها: **صدابردار**
**صدابندی** / sedābandî/: [عربی/ فارسی]/اسم/ کار یان ڕەوتی عایقکاری شتێ یان جێگایەک لە بەرانبەر دەنگەوە.
**صداپیشه** / sedāpîše/: [عربی/ فارسی]/اسم/ دووبلۆر؛ کەسێ کە بە جێگەی ئەکتەران قسەیان دەڵێتەوە.
**صداخفه‌کن** / sedāxafekon، ـها/: [عربی

فارسی]/اسم. دەنگبڕ؛ ئامێرێک بۆ کەمکردنەوەی دەنگ ‹صدا خفه‌کن اگزوز: دەنگبری ئیگزوز›.

**صدادار** / sedādār/: [عربی/ فارسی] صفت. ۱. دەنگدار؛ بە دەنگ؛ بە دەنگی بەرزەوە ۲. ☜ حروف صدادار، **حرف**

**صدارت** / sedārat, sadārat/: [عربی]/اسم. /ادبی/ ۱. سەرۆکایەتی؛ سەرۆکی ۲. سەرۆکوەزیری.

**صداع** / sodā'/: [عربی]/اسم. /ادبی/ سەرئێشە؛ سەرێشە؛ سەرەئێشە؛ ژانە سەر.

**صداق** / sedāq, sadāq/: [عربی]/اسم. /فقه/ مارەیی؛ مارەبڕانە.

**صداقت** / sedāqat, sadāqat، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. ڕاستبێژی؛ ڕاستوێژی؛ ڕاستگۆیی؛ ڕاسواچی ۲. درووستکاری؛ سەرڕاستی.

**صداگذاری** / sedāgozārî/: [عربی/ فارسی]/اسم. کار یان ڕەوتی دەنگ لە سەر دانان؛ تۆمار کردنی دەنگی پێویست لە سەر فیلم (وەک گفتوگۆ، مووسیقا، دەنگی شانۆ و...)

**صداگیر** / sedāgîr، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. دەنگبڕ؛ ئامێرێک بۆ کەمکردنەوە یان لە نێو بردنی دەنگەدەنگ.

**ـ صدایی** / sedāyî/: [عربی] پیواژه. ــ دەنگی؛ پێوەندیدار یان سەر بە دەنگەوە ‹آواز دوصدایی؛ همصدایی: ئاوازی دوودەنگی؛ هاودەنگی›: **صدائی**

**صدبخشی** / sadbaxšî/ ☜ درجه صدبخشی، **درجه**

**صدد** / sedad/: [عربی]/اسم. نیاز؛ ویست؛ خواز؛ وازی ئەنجامی کارێک ‹او در صدد شرکت در کنکور دانشگاه بود: بە نیازی بەشداری لە ئەزموونی زانستگادا بوو›.

◘ **در صدد برآمدن:** ویستن؛ بە نیاز بوون.

**در صدد بودن:** گەرەک/ هەرەک بوون؛ بە نیاز بوون؛ خوازیار بوون؛ ویستن؛ گەرەک بیەی؛ نیاز بیەی ‹او در صدد بود مغازه باز کند: گەرەکی بوو دوکان دانێ›.

**صددیناری** / sad.dînārî/: [فارسی/ یونانی از لاتینی]/اسم. /گفتاری/ تاکەقەرانی؛ سەددیناری؛ دەشایی؛ پەنابا؛ پەناوا؛ سکەیەکی ئێرانی تا دەکانی ۱۳٤۰ی کۆچی ــ هەتاوی باو بوو، بەرامبەر بە یەک ڕیاڵ: **صنّاری؛ صنّار**

**صدر** / sadr/: [عربی]/اسم. /ادبی/ ۱. سەرۆک؛ سەرەک ‹صدر مائو: سەرۆک مائۆ› ۲. /نامتداول/ سینگ؛ سنگ؛ سینە ۳. ژوور؛ سەر؛ بان؛ باڵا ‹صدر مجلس؛ از صدر تا ذیل: ژووری کۆڕ؛ لە بان تا خوار› ٤. سەرەتا؛ هەوەڵ؛ دەسپێک ‹صدر اسلام: سەرەتای ئیسلام› ٥. /ادبیات/ سەدر؛ پاژی هەوەڵ لە باڵی یەکەمی هەر دێڕێک.

**صدراعظم** / sadr(e)a'zam، ـها/: [عربی]/اسم. سەرۆکوەزیر؛ سەرۆکوەزیران.

**صدرنشین** / sadrnešîn، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. /ادبی/ بالانشین: ۱. ژوورنشین ۲. /کنایی/ پلە بان؛ بە پلە و پایەی بەرزەوە ۳. خاوەن بانترین پلە و پایە ‹صدرنشین مسابقات: بالانشینی کێبەرکێکان›.

**صدری**[1] / sadrî/: [عربی]/اسم. سەدری؛ چەشنێ برنجی زۆر باشی ئێرانی.

**صدری**[2]: صفت. سنگی؛ سینگی؛ سەر بە سینەوە ‹آنژین صدری: بەرهەنگی سنگی›.

**صدف** / sadaf، ـها/: [عربی]/اسم. سەدەف؛ لەپکە؛ قاوغ؛ قالک؛ گوێماسیلە؛ گەوهەران؛ پۆشەنی قسڵی کە بڕێ دەریاژیان بۆ خۆپارێزی دەریدەدەن و بە ماسوولکەیەک لە ناوەوە دەلکێن پێوە.

**صدفی** / sadafî/: [عربی] صفت. لەپکەیی؛ سەدەفی: ۱. چێکراو لە سەدەف ‹زیرسیگاری صدفی: ژێرسیگاری لەپکەیی› ۲. بە ڕەنگی بریقەدارەوە کە تیشک هەڵدەگەڕێنێتەوە ‹لاک صدفی: لاکی لەپکەیی› ۳. بە بیچمی سەدەف؛

وەکوو لەپکە.

**صدق** / sedq/: [عربی]اسم. [ادبی] ١. ڕاستی؛ ڕاسی ٢. دروستی؛ درووسی.

▣ **صدق کردن**: دروست بوون؛ درووس بوون؛ ڕێک بیەی؛ دەرهاتن ‹این حکم دربارەی همە صدق می‌کند: ئەم بڕیارە لەمەڕ هەمووانەوە دروستە›.

**صدقات** / sadaqāt/: [عربی] جمعِ ☜ **صدقه**

**صدقه** / sadaqe، ـها؛ صدقات/: [عربی]اسم. دەستاندە؛ سەدەقە؛ خێر؛ ماڵێ کە لە ڕێگەی خودا بە هەژاران دەدرێ ‹حالا که پولهایت پیدا شده بهتر است که صدقه بدهی: ئێستە کە پووڵەکانت دۆزرانەتەوە باشتر ئەوەیە دەستاندە بدەی›.

**صدقەسری** / sadaqesarî/: [عربی/ فارسی]اسم. [مجازی] سەدەقەسەری؛ ساقەی‌سەر: ١. بەلاگێڕەوە؛ بەلاگەردان؛ ئەوەی بە مرادی سەلامەت و بێ‌وەی بوونی کەسێ دەیگێڕنە دەوری سەریدا و دەیدەنە هەژارێ ٢. [گفتاری] ئەوەی کە بە خۆڕایی بە کەسێکی دەدەن.

▣ **از صدقەی سر کسی/ چیزی**: ساقەی سەر کەسێ/ شتێک؛ بە بۆنەی کەسێ/ شتێکەوە ‹از صدقەی سر پولهای پدرم بود که توانستی صاحبخانه شوی: ساقەی سەر پووڵ و پارەی باوکم بوو توانیت بویتە خاوەن‌ماڵ›.

**صدگان** / sadgān/:اسم. سەدەکان؛ سێهەمین پلەی ژمارەگەلی سەرەکی.

**صدم** / sadom/: صفت. سەدەم: ١. بە ڕیز، پلە یان ڕزنی سەدەوە ٢. دووهەمین پلەی دەیانە؛ دوای دەیەم.

**صدمات** / sadamāt/: [عربی] جمعِ ☜ **صدمه**

**صدمه** / sad(a)me، ـها؛ صدمات/: [عربی]اسم. گەزن؛ گەزەن؛ تەگەرە؛ زیان؛ ئازار؛ نسکۆ؛ ئاسیو؛ ئاسیب.

▣ **صدمه خوردن**: زیان لێکەوتن؛ گەزەن دیتن ‹من هم از تنبلی خودم صدمه خوردم: منیش لە تەوەزەلی خۆمەوە زیانم لێکەوت›. هەروەها: **صدمه دیدن؛ صدمه زدن؛ صدمه داشتن**

**صدمی** / sadomî/: ضمیر. سەدەمی؛ ئەوەی لە پلە، ڕیز یان جێگەی سەدەمدایە.

**صدمین** / sadomîn/: صفت. سەدەمین؛ سەتەمین؛ بە ڕیز، پلە و ڕزنی سەدەمەوە.

**صدور** / sudûr, sodûr/: [عربی]اسم. [ادبی] ١. چۆنیەتی دەرهاتن؛ دەرچوون؛ بەرشیەی ‹صدور دستور: دەرهاتنی فرمان› ٢. کار یان ڕەوتی دەرکردن ‹صدور گواهینامە: دەرکردنی بڕوانامە›.

**صدی** / sadî، ـها/: اسم. [گفتاری] سەدی؛ سەد تمەنی؛ ئەسکەناسی یەکسەد تمەنی ‹دو تا صدی گذاشتم کف دستش و آمدم بیرون: دوو دانە سەدیم نایە لەپی دەستی و هاتمەوە دەرەوە›.

**صدیق** / seddîq/: [عربی] صفت. [ادبی] ١. ڕاستبێژ؛ ڕاس‌وێژ؛ ڕاس‌واچ ٢. دروستکار؛ درووسکار؛ بێ‌خەوش؛ پاک.

**صراحت** / serāhat, sarāhat/: [عربی]اسم. ڕاشکاوی: ١. ڕاستە و ڕوو؛ بێ‌ڕووبینی؛ ڕاست و ڕەوانی؛ ڕاست و ڕووتی؛ ئاشکرایی و ڕوونی لە گوتنی مەبەستدا ‹با صراحت گفت که حاضر به همکاری نیست: بە ڕاشکاوی گوتی کە هاوکاری ناکا› ٢. ڕۆشنی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ئاشکرا بوون ‹صراحت لهجه: ڕوشنی قسە›.

**صراحتاً** / serāhatan, sarāhatan/: [عربی]قید. بە ئاشکرا؛ ڕاست؛ بەپانی؛ بە ڕاشکاوی ‹صراحتاً مخالفت کرد؛ صراحتاً می‌گویم: بە ئاشکرا بەرهەڵستی کرد؛ بە ڕاشکاوی دەڵێم›.

**صراحی** / sorāhî، ـها/: [عربی]اسم. ١. [ادبی] قەڕابە؛ قوڕابە؛ گۆزەڵە؛ تۆنگ؛ دەفری شووشەیی بە ملی باریکەوە ٢. [معماری] ئەستوونەک؛ کۆڵەکەئاسای لە گەچ، سیمان، بەرد یان چێو بۆ جوانکاری کە لە پەنایەک لەبەر هێوان یان لە سەر ڕزنی پلە، مەعجەرەیەک ساز دەکەن.

**صراط** / serāt, sarāt /: [معرب از لاتینی] *اسم. [ادبی]* ڕێ؛ ڕێگە؛ ڕێگا؛ ڕا.
▣ **به هیچ صراطی مستقیم نبودن:** *[مجازی]* بە هیچ شاتیمانێک ئیمان نەهێنان؛ بە هیچ مەزەبێ مل نەدان؛ بە هیچ شێوەیەک نەهاتنە سەر ڕێ ‹این همکار ما به هیچ صراطی مستقیم نیست: ئەم هاوکارەمان بە هیچ شایەتیمانێک ئیمان ناهێنێ›.

**صراف** / sarrāf ، ـها؛ ـان /: [عربی] *اسم.* گوهێڕ؛ دراوگۆڕەوە؛ کەسێ کە کاری سەودای پارە و بەڵگەگەلی بایەخدار دەکا.

**صرافت** / serāfat /: [عربی] *اسم. [گفتاری]* ئاهەنگ؛ ئەندێشە و بیری ئەنجامدانی کارێک.
▣ **از صرافت افتادن:** *[مجازی]* پاشگەز بوونەوە/ کردنەوە؛ دەست هەڵگرتن؛ دەس‌کێشان؛ واز هێنان؛ واز هاوردن؛ لە بیر و نیازی خۆ بۆ ئەنجامدانی کارێک پەشیمان بوونەوە ‹می‌خواست برود کانادا، خیلی زود از صرافت افتاد: دەیەویست بڕوا بۆ کانادا، بەڵام هەر زوو پاشگەزی کردەوە›. هەروەها: **از صرافت انداختن**
**بە صرافت افتادن:** لێ‌بڕان؛ بیر و نیازی ئەنجامدانی کارێک‌کردن ‹یک روز بە صرافت افتاد خانه‌اش را بفروشد و برود اروپا: ڕۆژێک لێی‌بڕا ماڵەکەی بفرۆشێت و بڕوا بۆ ئورووپا›. هەروەها: **به صرافت انداختن**

**صرافی** / sarrāfî /: [عربی] *اسم.* گوهێڕک؛ پارەفرۆشی: ۱. کاری کڕین و فرۆشتنی دراو و بەڵگەی بەبایەخ ۲. *ـها/* دووکان و شوێنی کاری پارەفرۆش.

**صرب** / serb /: *اسم.* سیرب: ۱. *ـها/* هەر یەکە لە مەردمی ناوەکی سیربستان یان لە ڕەتەوەکانیان ۲. هۆزێ لە ڕەگەزی سلاوی باشووری کە بە زمانی سیرب و کرۆوات قسە دەکەن و شێوە نووسینیان سیریلیە.

**صرب‌وکروات** / serb-o-k(o)rovāt /: *اسم.* سیرب و کرۆوات؛ لە زمانگەلی سلاو، لە لقی زمانگەلی باڵتو-سلاوی، لە دەستە زمانەکانی هیندو-ئورووپایی کە سیرب و کرۆواتەکانی گراقەی باڵکان پێی دەئاخێون.

**صربی**[1] / serbî /: *اسم.* سیربی؛ زمانی هۆزی سیرب.

**صربی**[2]: *صفت.* سیربی؛ سیربستانی؛ پێوەندیدار بە سیربستانەوە.

**صرصر** / sarsar /: [عربی] ☜ باد صرصر، **باد**

**صرع** / sar' /: [عربی] *اسم. [پزشکی]* فێ؛ پەرکەم؛ فەرکەم؛ خووداری؛ فێداری؛ خێ؛ تەپ؛ خوو؛ گەشکە؛ ئاهۆ؛ سا؛ ئیف؛ جۆرە ئاڵۆزیەکی جار و بارەیە لە مێشکدا بە هۆی خاڵی بوونەوەی نەگونجاوی پێلگەلی ئیلیکتریکی مێشک، کە هەمیشە لەگەڵ لێڵ بوونی ئاوەز و زۆر جار بزرکاوی لەشدایە.

**صرعی** / sar'î ، ـها /: [عربی] *صفت.* خوودار؛ خێدار؛ فێدار؛ سادار؛ تووشی نەخۆشی فێ.

**صرف** / sarf /: [عربی] *اسم.* ۱. خەرج؛ مەزخ؛ کار یان ڕەوتی خەرج‌کردن یان خەرج بوون ‹صرف پول: خەرجی پارە› ۲. *[گفتاری]* قازانج؛ بەهرە؛ سوود؛ هاقل ‹این کار صرف ندارد: ئەم کارە قازانجی نیە› ۳. *[دستور]* کاری هەڵدان؛ بە کار هێنانی دارشتەکانی کار بە پێی کات و کەس (وەک یەکەم کەسی تاکی ڕابردوو) ٤. کاری خواردن و خواردنەوە ‹چای و شیرینی صرف شد: چا و شیرینی خورا›. هەروەها: **صرف شدن؛ صرف کردن**

**صرف** / serf /: [عربی] *صفت.* تەنیا؛ تەنها؛ بەس؛ خاڵی؛ بەبێ شتێکی‌تر ‹تعارف صرف: خولکی تەنیا›.

**صرفاً** / serfan /: [عربی] *قید.* تەنها؛ تەنیا؛ بەس؛ هەر؛ بەبێ هیچ شتێکی‌تر ‹صرفاً قصد داشت سر و گوشی آب بدهد: تەنها گەرەکی بوو گوێیەک هەڵخا›.

**صرف‌نظر** / sarfenazar /: [عربی] *اسم.* چاوپۆشی؛ چەم‌پۆشی؛ گوزەشت.

■ **صرفنظر کردن:** چاو پۆشین؛ چاوپۆشی کردن؛ بووردن؛ هەڵبواردن ‹او از حق خودش صرفنظر کرد: لە مافی خۆی چاوپۆشی کرد›. هەروەها: **صرفنظر شدن**

**صرفه** / sarfe/: [عربی]/اسم. قازانج؛ سوود؛ بەهرە؛ باهر؛ کەڵک؛ هاقڵ.

▣ **با صرفه:** بە قازانج؛ شیاو و گونجاو دەگەڵ دەس پێوەگریدا ‹برای ما خرید کلی، باصرفه است: بۆ مە، سەندنی یەکجارەکی بەقازانجە›.

■ **صرفه داشتن:** بە قازانج بوون: ١. باش بوون ٢. بەکەڵک بوون؛ سوودمەن بوون. هەروەها: **صرفه کردن**

**صرفه‌جو** / sarfecû ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] صفت. دەس‌پێوەگر؛ هۆگر بە دەست بە شتەوەگرتن ‹هر قدر خودش ولخرج است، زنش صرفه جوست: هەرچیک خۆی هەڵەخەرجە، ژنەکەی دەس‌پێوەگرە›.

**صرفه‌جویی** / sarfecûyî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. دەس‌پێوەگری؛ قەگری؛ کاری دەست پێوەگرتن؛ گرتنەوە؛ کار و ڕەوتی سەرنج دان بۆ دروست خەرج‌کردن و هەروەها بەکاربردنی شتێک، بۆ بەرگری لە خەسار بوون و هەروەها بۆ کەڵک لێ‌وەرگرتنی باشتر و زۆرتر.

**صره** / sorre/: [عربی]/اسم./قدیمی/ هەمیان؛ تەکبەند؛ تەگەبەند؛ کیسەی پارە؛ پشتێندی لە مێشن بۆ پارە تێدا هەڵگرتن.

**صریح**[1] / sarîh/: [عربی] صفت. ئاشکرا؛ ئاشکار؛ روون؛ دیار؛ سەراڤکی؛ ڕەپ و ڕاست؛ بێ دەروایسی؛ بە واتای دیار و روونەوە ‹سخن صریح؛ انتقاد صریح: قسەی روون؛ ڕەخنەی ئاشکرا›.

**صریح**[2]: قید. ئاشکرا؛ ئاشکار؛ روون؛ بە ئاشکرا؛ بە ڕاشکاوی؛ پان‌بەپان ‹او حرفش را صریح گفت: ئاشکرا قسەی خۆی کرد›.

**صریحاً** / sarîhan/: [عربی] قید. بەڕاشکاوی؛ ئاشکرا؛ ئاشکار؛ سەراڤکی؛ ڕەپ و ڕاست؛ پان‌بەپان؛ بە ئاشکرا؛ ڕەپ و ڕەوان ‹این عمل را صریحاً محکوم کرد: ئەم کارەی بەڕاشکاوی تاوانبار کرد›.

**صعب** / sa'b/: [عربی] صفت. /ادبی/ دژوار؛ دژوار؛ دوژوار؛ دشوار؛ حاستەم؛ ئەستەم؛ گران؛ سەخت؛ چەتوون؛ ئارشە؛ ئاریشە؛ هەسەم؛ ئاسێ؛ هاسێ ‹کار صعب: کاری دژوار›.

**صعب‌الحصول** / sa'bolhusûl, -hosûl/: [عربی] صفت. /ادبی/ دوورەدەست؛ دووردەس؛ بە هەلی دژوارەوە بۆ دەستکەوتن ‹چنین موفقیتی صعب‌الحصول است، ولی ارزش تلاش دارد: وەها سەرکەوتنێک دوورەدەستە، بەڵام بۆ تێکۆشان دەشێ›.

**صعب‌العبور** / sa'bol'ubûr, -'obûr/: [عربی] صفت. /ادبی/ سەخناخ؛ ساخناخ؛ سەختان؛ ڕژد؛ ئاستەنگ؛ بە ڕێگە بواری دژوارەوە ‹راههای صعب‌العبور کوهستانی: ڕێگە سەخناخەکانی کوێستان›.

**صعب‌العلاج** / sa'bol'alāc, -'elāc/: [عربی] صفت. /ادبی/ ملتاف؛ گران؛ بێ‌دەرمان؛ دەردەگروو؛ بە هەل و چەلی کەم یان درێژخایێن بۆ دەرمان بوون ‹پژوهش برای درمان بیماریهای صعب‌العلاج: تۆژینەوە بۆ دەرمانی نەخۆشیگەلی ملتاف›.

**صعب‌الوصول** / sa'bolvusûl, -vosûl/: [عربی] صفت. /ادبی/ دەس‌نەکەوت؛ دوور لە دەست؛ بە هەلی پێگەیشتنی دژوارەوە ‹غار در یک نقطه‌ی صعب‌الوصول قرار دارد: ئەشکەوتەکە لە جێگایەکی دەس‌نەکەوتدایە›.

**صعوبت** / su'ûbat, so'ûbat/: [عربی]/اسم. /ادبی/ دژواری؛ دوژواری؛ حاستەمی؛ ئەستەمی ‹به علت صعوبت کار، افراد کمی آن را می‌پذیرند: بە بۆنەی دژواری کارەکەوە، کەم کەس خۆی لێ دەدا›.

**صعود** / su'ûd, so'ûd /: [عربی]*اسم.[ادبی]* کار یان ڕەوتی هەڵچوون؛ هەڵاچوون؛ چوونە سەر؛ هەوڕ وەسەی؛ بەرەو سەرەوە ڕۆیشتن ‹محمد اوراز توانست بدون کپسول اکسیژن بە اورست صعود کند: موحەممەدی ئەوراز توانی بەبێ کەپسوولی ئوکسیژن بە ئیوریستدا هەڵچی›.

**صعودی** / su'ûdî, so'ûdî /: [عربی] *صفت.[ادبی]* هەڵاچۆ؛ هەڵبڕ؛ بە تایبەتمەندی لە زیادکردندا بوون.

**صعوه** / sa've /: [عربی]*اسم.* فیسقە گولە؛ فیڕنە گولە؛ کرکرک: ۱. تیرەیەک پەلەوەری وەک چۆلەکە، بە دەندووکی باریک و نووسکن، کە بە شێوەیەکی تایبەت بەڕێوە دەچن و کلک و باڵیان دەبزێون، زۆر توند و بە مەودای کورت دەفڕن ۲. هەریەکە لە پەلەوەرانی ئەو تیرە.

▣ **صعوەی کلاەدار**: مووتە؛ مەلێکی لە تیرەی فیسقەگولە بە دەنگێکی زۆر خۆشەوە.

**صغار** / seqār /: [عربی] جمعِ ☜ **صَغیر**

**صغر** / seqar /: [عربی]*اسم.[ادبی]* ۱. منداڵی؛ منالی؛ منداری؛ زارۆیی؛ زارۆلەیی؛ وردساڵی؛ کەمتەمەنی ۲. چکۆلەیی؛ چکوولەیی؛ بچووکی؛ بووچکی؛ گچکەیی؛ گولالەیی.

▣ **صغر سن**: کەم تەمەنی؛ تەمەن کورتی.

**صغرا** / soqrā /: [عربی]*اسم.* ۱. *[منطق]* پێشەکیەک کە بناغەی مەبەستە و باسی لە سەر دەکرێ ۲. بچووکتر؛ چکۆلەتر؛ گچکەتر؛ گولالەتر؛ وردیتەر.

▣ **صغرا و کبرا چیدن**: *[کنایی]* شێرێ لێرە و ڕێویەک لەوێ؛ ئەم بان و ئەو بان کردن؛ سێ و دوو/ شێتە و ژیرە هێنانەوە؛ وەکوو پێشەکی قسە و باسێک داهێنان بۆ چوونەوە سەر باسی مەبەستی سەرەکی.

**صغیر** / saqîr ، ـها؛ صغار /: [عربی] *صفت.* ۱. منداڵ؛ منال؛ مندار؛ زاولە؛ زارۆ؛ خاوەن تەمەنی کەمتر لە تەمەنی قانوونی ‹هنوز صغیر است: هێشتا منداڵە› ۲. *[فقه]* منداڵ؛ منال؛ مندار؛ زاولە؛ بە تەمەنێکی کەمتر لەوەی بەجێهێنانی ئەرکی دینی لە سەری بێ ۳. وردساڵ؛ کەمتەمەن ‹فرزند صغیر: منداڵی وردساڵ› ٤. *[ادبی]* چکۆلە؛ چکوولە؛ چووکە؛ بووچک؛ بچووک؛ گچکە؛ گولالە. بەرانبەر: **کبیر** ‹آسیای صغیر: ئاسیای چکۆلە›.

**صغیره** / saqîre /: [عربی] ☜ گناه صغیره، **گناه**

**صف** / saf(f) ، ـها؛ صفوف /: [عربی]*اسم.* سەف؛ سەفە؛ ڕاڤ؛ ڕیز؛ زنجیرە: ۱. سان؛ کۆمەڵێک لە شت یان کەسان کە زۆرتر بە شێوەی تەکووز لە تەنیشت یان پشتی یەکەوەن ‹صف اتوبوس؛ صف نان: سەفی ئوتووبووس؛ ڕاڤی نان› ۲. ڕزن؛ پێڕە؛ هێڵێک کە بەم شێوە بەدیهاتووە ‹اول صف؛ آخر صف: سەرەتای سەف؛ ئاخری زنجیرە› ۳. *[مجازی]* پۆل؛ پێڕ؛ پێرە؛ گرۆ ‹او هم به صف مخالفان پیوست: ئەویش چووە پۆلی نەیارانەوە›.

▣ **صف بستن/ کشیدن**: ڕیز بەستن؛ ڕێچکە بەستن؛ قەتار بوون؛ قەتارە بەستن؛ سەف پێکەی؛ خێزەرە بەستن ‹بروید حیاط و صف ببندید: بڕۆنە حەوشەوە ڕیز ببەستن›.

**به صف کردن**: ڕیز کردن؛ بە شێوەی قەتارە دەرهێنان ‹همه را به صف کردند: هەموویان ڕیز کرد›.

**صف‌آرایی** / saf'ārāyî ، ـها /: [عربی/ فارسی] *اسم.* کار یان ڕەوتی ڕیز بەستن؛ بە قەتار بوون؛ ئامادە بوونی گرۆیەک بۆ ملە لەگەڵ گرۆیەکی تردا ‹دو تیم در برابر یکدیگر صف‌آرایی کردند: دوو تیم لە بەرانبەر یەکەوە ڕیزیان بەست›.

**صفا** / safā /: [عربی]*اسم.* سەفا: ۱. شەنگی؛ تەرچکی؛ پاراوی؛ گەشی؛ تەڕوبەری؛ تەڕی و تازەیی ‹آن روزها این باغ صفایی داشت: ئەو ڕۆژانە ئەم باخە سەفایەکی بوو› ۲. خاوێنی؛ دووری لە

پیسی و خەوشی ‹سر و صورت را صفا دادن: سەر و ریش سەفا دان› ۳. /مجازی/ هاودڵی؛ یەکدڵی؛ دۆستایەتی و یەکڕەنگی ‹آدم باصفا: مرۆی باسەفا›.

▣ **صفا آوردن:** سەفا هێنان؛ خۆشی هێنان؛ بوونە هۆی شایی و خۆشی ‹خوش آمدید صفا آوردید: بە خێرێن سەفاتان هێنا›.

**صفا دادن:** /مجازی/ پاک و خاوێن کردنەوە؛ پاک و پوختەکەردەی ‹همه چیز را شست و رُفت و صفا داد: هەموو شتێکی شۆرد و گەسکیدا و پاک و خاوێن کردەوە›.

**صفا داشتن:** سەفا هەبوون؛ باسەفا بوون؛ خۆش و دڵگر بوون ‹خانەشان خیلی صفا داشت: ماڵیان زۆر سەفای هەبوو›.

**صفا کردن:** /مجازی/ ۱. خۆش ڕابواردن؛ لە دۆخ یان جێگایەک کەیفکردن ‹آن شب خیلی صفا کردیم: ئەو شەوە زۆر خۆشمان ڕابوارد› ۲. /نامتداول/ دلۆڤانی نیشاندان ‹صفا کردی کە اینجا خانە کردی: دلۆڤانیت نیشان دا هاتیە لامان›.

**صفات** / sefāt/: [عربی] جمعِ ☜ **صِفت**

**صفاق** / sefāq/: [عربی] /اسم. /کالبدشناسی/ چەقاڵتە؛ چەرمەچەقاڵتە؛ پەردەی تەنک و دوو تۆی ناوزگ کە هەناو و هەموو ئەندامانێ کە تێدایە دادەپۆشێ: **پردەی صفاق**

**صفت** / sefat، ـها/: [عربی] /اسم. ۱. / صفات/ دانستە؛ چۆناوچۆنی؛ تایبەتی؛ گەوشت؛ چۆنیەتی یان نیشانەی شتێ یان کەسێک کە بەوەوە بکرێ ئەو شتە یان ئەو کەسە بناسرێ، ڕیزبەندی بۆ دانرێ یان لەمەڕیەوە دادوەری بکرێ ‹صفت ارثی؛ صفت اکتسابی: دانستەی میراتی؛ چۆناوچۆنی دەسکەوتی› ۲. / صفات/ خۆ؛ خوو؛ خدە؛ گەد ‹راستگویی صفت خوبی است: ڕاستبێژی خویەکی چاکە› ۳. /دستور/ ئاوەڵناو؛ ئاوڵناو؛ وشەیێ کە پێناسەی ناو دەکات و نیشاندەری چۆنیەتی یان چەندیەتیە ‹صفت مفعولی: ئاوەڵناوی بەرکاری›.

▣ **صفت ارثی** ☜ **صفت موروثی**

**صفت اشاره:** /دستور/ ئاوڵناوی ئاماژە؛ ئاوڵناوێک کە بە شتێ یان کەسێک ئاماژە دەکات (وەک: ئەم، ئەمە، ئەو).

**صفت اکتسابی:** /زیستشناسی/ دانستەی دەسکەوتی؛ تایبەتیەک کە بوونەوەرێک بۆی هەیە دوایی بە دەستی بێنێ. بەرانبەر: **صفت ذاتی**

**صفت بارز:** /زیستشناسی/ دانستەی دیار/ بەرچاو؛ تایبەتمەندیەک کە خوانەخوا خۆی دەردەخا. بەرانبەر: **صفت نهفته**

**صفت برتر** ☜ **صفت تفضیلی**

**صفت برترین** ☜ **صفت عالی**

**صفت بسیط:** /دستور/ ئاوڵناوی سادە؛ ئاوڵناوێ کە لە وشەیەک دروست بووە (وەک: خراپ، باش، دروست).

**صفت پرسشی:** /دستور/ ئاوەڵناوی پرسیار؛ ئاوڵناوێ کە لەمەڕ شتێ یان کەسێکەوە دەپرسێ (وەک: چۆن؟، کامە؟).

**صفت پیراجنسی** ☜ **صفت ثانوی**

**صفت تعجبی:** /دستور/ ئاوەڵناوی سەرسووڕماوی؛ ئاوڵناوێ کە نیشانەی سەیر مان و سەمەرەیی بێت.

**صفت تفضیلی:** /دستور/ ئاوەڵناوی هەڤیازی؛ ئاوڵناوێ کە نیشانەی بانتری شتێک بە سەر شتێکی تر یان ئەوانیترە (وەک: باشتر، خراپتر): **صفت برتر**

**صفت ثانوی:** /زیستشناسی/ تایبەتمەندیەکی جەستەیی یان ئاکاری کە دوایی لە گیانداردا بەدی دێ (وەک: ڕیش دەرهێنانی پیاو): **صفت پیراجنسی**

**صفت ثبوتی:** /زیستشناسی/ تایبەتیەک کە لە کەس یان شتێکدا، هەمیشەییە (وەک: تەڕی

بۆ ئاو). بەرانبەر: **صفت سَلبی**

**صفت جامد:**/*دستور*/ ئاوەڵناوێک کە لە وشەیەکی تر نەگیرابێت (وەک: داخ، سارد). بەرانبەر: **صفت مشتق**

**صفت ذاتی:**/*زیست‌شناسی*/ دانستەیەک کە هەر لە سەرەتاوە لەگەڵ شتێکدایە (وەک: گیان بۆ زیندوو). بەرانبەر: **صفت اکتسابی**

**صفت سَلبی:** دانستەیەک کە نیشاندەری نەبوونی شتێکە (وەک نەزان، نەخوێندەوار). بەرانبەر: **صفت ثبوتی**

**صفت شمارشی:**/*دستور*/ ئاوەڵناوێ کە نیشانەی ژمارە یان جێگای کەس یان شتێکە (وەک پێنجەم، دەیەم).

**صفت عالی:**/*دستور*/ ئاوەڵناوێ کە خاوەنەکەی هەڤیازی بە سەر هەموو ئەوانی‌ترەوەیە (وەک باشترین، خراپترین): **صفت برترین**

**صفت فاعلی:**/*دستور*/ ئاوەڵناوی کرۆکی؛ ئاوەڵناوێ کە نیشاندەری لێهاتووی جێبەجێ کردنی کارێکە لە لایەن خاوەنەکەیەوە (وەک سووتێنەر، کڕیار، باخەوان).

**صفت مبهم:**/*دستور*/ ئاوەڵناوی نەدیار؛ ئاوەڵناوێ کە نیشاندەری شت یان کەسێکی نەدیارە (وەک فلانی، کەسێک).

**صفت مرکب:**/*دستور*/ ئاوەڵناوی لێکدراو؛ ئاوەڵناوێ کە لە دوو یان چەند وشە بەدیهاتووە (وەک بەلەپا، تەردەست).

**صفت مشبهه:**/*دستور*/ ئاوەڵناوێ کە پایەدار یان درێژەدارە (وەک هێژا، توانا).

**صفت مشتق:**/*دستور*/ ئاوەڵناوێ کە لە وشەی‌تر وەرگیراوە (وەک نەزان، زانا، خوراو). بەرانبەر: **صفت جامد**

**صفت مشخصه/ مُمیزه:** تایبەتمەندی کەس یان شتێ کە بەوەوە بناسرێت (وەک: درێژ، کورت، زاڵ).

**صفت مغلوب** ☜ **صفت نهفته**

**صفت مفعولی:**/*دستور*/ ئاوەڵناوی بەرکاری؛ ئاوەڵناوێ کە نیشانەی کار یان کریانی دۆخێک بە سەر کەس یان شتێکەوەیە (وەک پساو، گیرۆدە).

**صفت موروثی:**/*زیست‌شناسی*/ دانستەیەک کە گیانەوەر لە پێشینانی خۆی وەریگرتووە: **صفت ارثی**. بەرانبەر: **صفت اکتسابی**

**صفت نسبی:**/*دستور*/ ئاوەڵناوێ کە سەبارەت بە کەس یان شتێکەوە بێت (وەک پیاوانە، ژنانە، بانەیی).

**صفت نهفته:**/*زیست‌شناسی*/ تایبەتمەندیەک کە لە کەس یان شتێکدا هەیە، بەلام خۆی دەرناخا: **صفت مغلوب**. بەرانبەر: **صفت بارز**

**صفحات** / safahāt/: [عربی]/*اسم*. ١. جمعِ ☜ **صفحه** ٢. دەشت و دەر؛ بەر و بووم؛ کێو و دەشتی بەرین و بێ‌ئاقار ‹در تعطیلات عید به صفحات شمال رفته بودیم: لە نەورۆزدا چووبووین بۆ دەشت و دەری باکوور›.

**صفحه** / safhe، ـها/: [عربی]/*اسم*. سەفحە: ١. / صفحات/ لاپەڕە؛ ڕووپەڕ؛ پەڕە؛ هەر یەکە لە دوو لای بەرگێکی کاغەز، مقەوا و وەکوو ئەوانە ‹صفحه‌ی کاغذ؛ صفحه‌ی کتاب: ڕووپەڕی کاغەز؛ پەڕەی کتێب› ٢. / صفحات/ لاپەڕە؛ پەڕە؛ ئەوەی لە سەر پەڕەیەکدا دەنووسرێ ‹یک صفحه از کتاب را خواندم: لاپەڕەیەک لە کتێبەکەم خوێندەوە› ٣. شاشە؛ ڕوو؛ بەری تەخت و لووس ‹صفحه‌ی ساعت: سەفحەی کاتژمێر› ٤./*هندسه*/ ڕووپەڕێکی تەختی بە بێ ئەستوورایی ٥. قەوارووک؛ سێلک؛ سەفحەی قەوانە؛ ئامێرێکی زۆرتر پلاستیکی (کاغەز یان کانزا) بۆ تۆمارکردنی دەنگ لە سەری.

⊡ **صفحه‌ی تصویر/ نمایش:** شاشە؛ سەفحەی کەرەستەیەکی دیمانەیی کە تێیدا وێنە یان نووسراوە لە خانگەلێکی ڕووندا دەبینرێن: **نماگر**

**صفحه‌ی ساعت**: شاشه‌ی کاتژمێر؛ ڕووپه‌ڕی به‌رووی سه‌عات که کات نیشان ده‌دا.

**صفحه‌ی شطرنج**: سه‌فحه‌ی شه‌ترەنج؛ ڕووپه‌ڕێکی ٦٤ خانی سپی و ڕەش که له‌سه‌ریه‌وه شه‌ترەنج ده‌که‌ن.

**صفحه‌ی شناسنامه**: لاپه‌ڕه‌ی پێناسه؛ ڕووپه‌ڕێک له سه‌ره‌تای کتێبدا که ناو و نیشانی چاپه‌مه‌نی و به‌روار و ساڵ و شوێنی چاپه‌که‌ی و... تێدا نووسراوه.

**صفحه‌ی عنوان**: لاپه‌ڕه‌یه‌ک له ده‌سپێکی کتێبدا که ناوی کتێبه‌که‌ی تێدا نووسراوه.

▣ **صفحه پر کردن**: پڕکردنه‌وه؛ تۆمارکردن؛ هه‌ڵگرتنی ده‌نگ له سه‌ر ڕووپه‌ڕی گرامافون ‹چند صفحه از سید علی اصغر کردستانی پر کردند: چه‌ند قه‌وانیان له سه‌ی ئه‌سکه‌ر پڕکرده‌وه›.

**صفحه‌آرایی** / safhe'ārāyî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /سم. کاری دانانی نووسراوه، وێنه، ژماره‌ی لاپه‌ڕه و ئاماده‌کردنی کتێب، ڕۆژنامه یان گۆڤار بۆ چاپ: **لیات**. هه‌روه‌ها: **صفحه‌آرا**

**صفحه‌ای**[1] / safhe'î/: [عربی] صفت. لاپه‌ڕه‌یی؛ ڕووپه‌ڕی؛ په‌ڕه‌یی؛ وه‌ک سه‌فحه ‹آنتن صفحه‌ای: ئانتینی په‌ڕه‌یی›.

**صفحه‌ای**[2]: قید. لاپه‌ڕه‌یه‌ک؛ ڕووپه‌ڕێک؛ په‌ڕه‌یێ؛ لاپه‌ڕێو؛ به پێی سه‌فحه ‹صفحه‌ای ٥٠٠ تومان برای پاکنویس می‌گرفت: لاپه‌ڕه‌یه‌ک ٥٠٠ تمه‌نی بۆ پاکنووس وه‌رده‌گرت›.

**صفحه‌بندی** / safhebandî/: [عربی/ فارسی] /سم. کاری دانانی پیتی چاپی، سه‌رپه‌ڕه، ژماره‌ی لاپه‌ڕه، ژێرنووس، په‌راوێز و ... هه‌رکام له جێی خۆی و به‌ستنیان پێکه‌وه بۆ ئاماده‌ی چاپ بوون. هه‌روه‌ها: **صفحه‌بند**

**صفحه‌کلید** / safhekilîd, -kelîd ، ـها/: [عربی/ یونانی] /سم. کیبۆرد؛ ئامێرێ له ده‌سگایه‌ک (وه‌ک که‌مپیۆتر) بریتی له برێک دوگمه‌ی هه‌ڵوه‌ژێراو، که به گوشاردانی هه‌رکام کارێکی تایبه‌ت ئه‌نجام ده‌درێ: **کی‌بُرد**

**صفر** / safar/: [عربی] /سم. سه‌فه‌ر؛ مانگی دووهه‌می ساڵی کۆچی ـ مانگی.

**صفر** / sefr/: [معرب از سنسکریت] /سم. سفر؛ سیفر: ١. /ـها/ نیشانه‌یه‌کی بیرکاری به شێوه‌ی «٠» که نیشانده‌ری نه‌بوونی چه‌ندیه‌تیه‌که ٢. خاڵی که‌وتنه ڕێ له حه‌سێب‌کردن یان ئه‌ندازه‌گیریدا ‹نقطه‌ی صفر درجه‌ی هواسنج: خاڵی سیفری پله‌کی هه‌واپێو› ٣. که‌مترین نمره‌ی وانه‌یی که نیشانه‌ی لێنه‌هاتوویی قوتابیه له‌و کارانه‌ی که لێی خوازراوه ‹در شیمی صفر گرفتم: له کیمیادا سیفرم‌گرت› ٤. دۆخی نه‌بوون یان بێبار بوون ‹نتیجه‌ی مسابقه صفر بر صفر شد: ئاکامی کێبه‌رکێ سفر به سفر بوو›.

▣ **صفر مطلق** ☜ دمای صفر مطلق، **دما**

▣ **صفر دادن**: سیفردان؛ سفردان؛ به بۆنه‌ی نه‌بوونی پشک و شیاوی که‌مترین نمره به شتێ یان که‌سێک دان ‹به انشایم صفر دادند: به ئینشاکه‌م سیرفیان دا›.

**صفر گرفتن**: سیفر گرتن؛ به‌ده‌س‌هێنانی که‌مترین نمره یان پشک.

**صفرا** / safrā/: [عربی] /سم. زه‌رداو؛ زه‌رتاڵ؛ کرانتی؛ تالاو؛ سه‌فرا؛ خه‌رداو؛ زێلک؛ تراوی زه‌ردی مه‌یله‌و سه‌وز، تاڵ که له جه‌رگه‌وه ده‌رژێته دوازده‌یینه.

**صفرابر** / safrābor ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. زه‌رداوبڕ؛ که‌م‌که‌ره‌وه‌ی ده‌ڵانی زه‌رتاڵ.

**صفراوی** / safrāvî/: [عربی] صفت. ١. زراوی؛ زه‌رداوی؛ زراقی؛ پێوه‌ندیدار به زه‌رتاڵه‌وه ٢. ڕمووزن؛ ڕمووزین؛ مه‌ڕمووکه؛ مرداره‌وبووگ؛ له‌ڕ و لاواز، ڕه‌نگ زه‌رد، چه‌ماوه، ڕه‌ش‌بین و گرژ و مۆن.

**صفراوی‌مزاج** / safrāvîmezāc, -mazāc ، ـها/:

[عربی] *صفت*. ڕمووزین؛ ڕمووزن؛ مردارەو بووگ؛ مەڕمووکە؛ لەڕ و لاواز، گرژ و مۆن، زەرد هەڵگەڕاو، ڕەش‌بین و داچەکاو.

**صفر کیلومتر** / sefrkîlometr, -kîlûmetr/: [معرب/ فرانسوی] *صفت*. ۱. سفرکیلۆمیتر؛ وشک؛ تازە و نوێ؛ بەڕێوە نەچوو (سەبارەت بە ماشێن) ‹اتومبیل صفرکیلومتر: ماشێنی سفرکیلومیتر› ۲. *لـها//مجازی/* بێ‌ئەزموون؛ کاڵ؛ کاڵ و کرچ ‹یک رییس صفرکیلومتر برایمان فرستادند که از هیچ خبر ندارد: بەرپرسێکی بی‌ئەزموونیان بۆ ناردووین هەر تەقەی سەری دێ›.

**صفوف** / sufûf, sofûf/: [عربی] جمعِ ☜ **صَف**

**صفه** / soffe ، ـها/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* ۱. سەکۆ؛ دکە؛ دک؛ دەکە؛ خواجەنشین ۲. شانشین؛ باڵاخانە؛ ئۆدەی گەورە ۳. دالان؛ هەیوانی سەرداپۆشراو.

**صفیر** / safîr/: [عربی]/*اسم*. فیشکە؛ گڕە؛ گڤە؛ هووڕە؛ لوورە؛ دەنگی بەرز و تیژ کە بە هۆی گوشاری نەکاوەوە لە هەوادا بەدی دێ ‹صفیر باد؛ صفیر گلوله: فیشکەی با؛ گڕەی گوللە›.

**صقر** / saqr ، ـها/: [معرب از فارسی]/*اسم*. هولیلک؛ سەقر؛ چەرخ؛ باڵدارێکی ڕاوکەرە.

**صلا** / salā/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* جاڕ؛ قاو؛ دەنگ؛ گاز؛ بانگ؛ هاواری بانگیشتن.

▣ **صلای عام**: جاڕی هەموانی؛ بانگی گشتی.

**صلابت** / salābat/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* ۱. *[نامتداول]* دژواری؛ سەختڵەتی ۲. دامەزراوی؛ پێوەجێیی؛ پتەوی؛ قایمی؛ گورخی.

**صلابه** / sollābe ، ـها/: [از عربی]/*اسم*. سێچوکڵە؛ قولاو؛ چنگەک؛ نهک؛ ئەو ئامێرە کە لە قەساوخانە گۆشتی پێدا هەڵدەواسن.

▣ **به صلابه کشیدن**: *[کنایی]* لە دار قەواخ دان؛ کێشانە دار؛ چەرم دەق کردن؛ دار قەپان دان؛ لە بەر ئازاری ڕۆحی و جەستەیی زۆردا دانان ‹می‌خواهی به خاطر یک ساعت دیر آمدن او را به صلابه بکشم؟: دەتهەوێ بە بۆنەی سەعاتێک دێر هاتن لە دار قەواخی بدەم؟›.

**صلات** / salāt/: [عربی]/*اسم*. نوێژ؛ نمێژ؛ مێژ؛ نڤێژ؛ نۆژ؛ نمێ؛ نما: **صلوة**

▣ **صلات ظهر**: بانگی نیوەڕۆ؛ کاتی نیوەڕۆ؛ قاوەتوو؛ نوێژ نیمەڕۆ ‹صلات ظهر است، تو تازه می‌خواهی صبحانه بخوری: بانگی نیوەڕۆیە، تازە دەتەوێ بەرقلیان بخۆی›.

**صلاح** / salāh/: [عربی]/*اسم*. ۱. باشی؛ چاکی؛ خاسی؛ قەنجی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لەبار و شیاو بوون ‹ما صلاح تو را می‌خواهیم: ئێمە باشی تۆمان دەوێ› ۲. قازانج؛ کەڵک ‹اگر بروی به صلاح توست: ئەگەر بڕۆی قازانجتە› ۳. بەرژەوەندی ‹صلاح ندید بروم: بەرژەوەندی تێدا نەبینی بڕۆم›.

▣ **صلاح بودن**: بە قازانج بوون؛ شیاو بوون؛ بەکەڵک بوون.

**صلاح دانستن**: باش زانین؛ چاک زانین؛ بە شیاو و سوودمەن زانین.

**صلاح دیدن**: باشتر بینین؛ چاتر بینین؛ خاستر دین؛ شیاو و بە قازانج دیتن.

**صلاح کسی را خواستن**: باشی/ چاکی کەسێک ویستن؛ خاسی کەسێ گەرەک بوون؛ خوازیاری قازانجی کەسێک بوون.

**به صلاح کسی بودن**: بۆ کەسێک چاک/ باش بوون؛ بە خێر و قازانجی کەسێک بوون.

**صلاح‌اندیشی** / salāhandîšî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /*اسم*. کار و ڕەوتی بە باش زانین؛ تێڕامان و تێفکرین لەمەڕ کار و شێوازی دروست و بەهرەدارەوە ‹دوستان این‌طور صلاح‌اندیشی کردند که فعلاً شرکت را تعطیل کنیم: دۆستان وایان بە باش زانی جاریٚ شیرکەت داخەین›: **صلاح و مصلحت** *[گفتاری]*

**صلاح و مصلحت** / salāh-o-maslahat/: [عربی]

☜ **صلاح‌اندیشی**

**صـــلاحیت** / salāhîyyat ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. لێوەشاوی؛ لێهاتوویی؛ هێژایی؛ شـیاوی؛ دۆخـی هـەبوونی مـەرج و تواناییگـەلی پێویـست بـۆ ئەنجامدانی کارێک ‹کسی که برای صندوقداری آمده بود صلاحیت لازم را نداشت: ئـەو کـەسـەی کـە بـۆ دەخـڵداری هـاتبوو لێوەشـاوی پێویـستی نـەبوو›.

هەروەها: **صلاحیت داشتن**

**صلب** / solb/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ۱. گت؛ سفت؛ تۆکمە؛ ڕەق؛ بە بیچمـی خـۆگرەوە کـە هاسـان نەچەمێتەوە ‹سنگ جسم صلب است: بـەرد مـاکێکی گتە› ۲. *[نامتداول]* پێوەجێ؛ قایم؛ گـورخ؛ پتـەو؛ پەیت.

**صلبیه** / solbîyye/: [عربی]/*اسم.* سـپیێنەی چـاو؛ چەرمێنـەی چـاو؛ بەشـی لیفـی، چـڕ، سـپی و بریقەداری چاو کە دەرەکی‌ترین پۆشـەنی گـۆی چاوە (بێجگە لە گلێنە).

**صـــلح** / solh/: [عربـی]/*اسـم.* ئاشـتی؛ هاشـتی: ۱. دۆخێـک کـە بـە هـۆی کۆتـایی هـاتن یـان نەبوونی شەڕ و کێشەوە بەدی دێت ‹اینک اروپا در صلح به سر مـی‌برد: ئێـستا ئورووپـا لـە ئاشـتیدایە› ۲. تـەنایی؛ تـەناهی؛ تـەبایی؛ کـار یـان ڕەوتی کۆتایی هێنان بە شـەڕ و گـەلش ‹سـرانجام زن و شوهر با پادرمیانی همسایه‌ها صلح کردند: لە ئاکامـدا ژن و شووەکە بـە نێوانجیگـەری دراوسـێکان ئاشـتییان کردەوە› ۳. *[حقوق]* کاری دەست‌کێشانی دادبـەر یان خاوەن ماف لە مافی خۆی لە بـایی شـتێک یان هەر وا. هەروەها: **صلح شدن؛ صلح کردن**

**صلحبان** / solhbān ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ئاشتیوان؛ پارێزەری ئاشتی.

**صلحجو** / solhcû ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ئاشتیخواز؛ هێمنایەتی‌خواز؛ خوازیاری تـەناهی و ئارامشت: **صلحخواه؛ صلحطلب**

**صـــلحخواه** / solhxāh/: [عربـــی/ فارســـی] ☜ **صلحجو**

**صـلح‌طلـب** / solhtalab/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **صلحجو**

**صلوات** / salavāt/: [عربـی] *دعـا.* سـەلام؛ درووود؛ سەڵەوات؛ سەڵواتە؛ ڕستەی «اللّهم صَلّ عَلی محمّد و آلِ محمّد» بە مانـای (درووود و سـەلامی خـودا لـە سەر پێغەمبەر و بنەماڵەی).

◙ **صـــلوات خـــتم کـــردن:** سەڵـــەوات نـــاردن؛ سەڵەوات دان.

**صلوات فرستادن:** سەڵەوات ناردن: ۱. گـوتنی سەڵەوات؛ سەڵوات دان ۲. *[مجازی]* بە وت‌وویژ (زۆرتر شەڕەقسە) کۆتـایی هێنـان ‹بس است دیگر، صـلواتی بفرسـتید: بەسـە ئیتـر، سەڵـەواتێک بنێرن›.

**صلواتی** / salavātî/: [عربی] *صفت.* ۱. سەڵەواتی؛ سەڵواتی؛ شیاوی سەڵـەوات ‹پدر صـلواتی: بـاوک سەڵەواتی› ۲. *[مجازی]* خۆڕایی؛ مفتـە؛ مـەجانی بەلام پێویست بـە نـاردنی سەڵـەوات ‹در مناطق جنگی تلگراف صلواتی دایر شد: لە ناوچەگـەلی شـەڕدا تیلگرافی خۆڕایی دانرا›.

**صلوة** / salāt/: [عربی] ☜ **صلات**

**صله** / sele ، ـها/: [عربـی]/*اسـم.* خـەلاتی؛ ڕێزانـە؛ شاباش؛ هبوودی؛ خـەلات یـان ماڵـێک کـە بـە کەسێ دەدرێ.

◙ **صلەی رَحِم:** خزم‌دۆستی؛ مێرەوانی و دلۆڤانی لەگەڵ خزم و کەسان.

**صـــلّی‌الله** / sallallāh/: [عربـــی] *دعـــا. [مخفـــف]* درووودی خودا لە سەری.

**صلیب** / salîb ، ـها/: [معرب از آرامـی]/*اسم.* خـاچ؛ چەلیپا؛ چەلیپ؛ چەقر؛ سەلیب؛ چەپ و ڕاسـت: ۱. پێکهاتەیەک بـریتی لـە دوو تـیری ڕاسـت و خەوتوو بە بیچمی «✝» کە پێشووتر ڕوومیگـەل بـۆ سـزادان و کوشـتنی نـەیارانیـان کەڵـکیان لێوەردەگرت ۲. پەیکەرێکی دروسـت‌کـراوە بـە بیچمی خاچ ‹در یک دست صلیب و در یـک دست انجیل، وارد کلیسا شد: خاچ لـە دەسـتێکی و ئینجیـل

لەو دەستیدا، هاتە نێو کڵێسەوە› ۳. نەخشێ بە شێوەی چەپ و ڕاست ‹بە روی سینەاش صلیب کشید: لە سەر سینگی چەلیپای کێشا› ٤. */نجوم/* خاچی باشووری؛ وێنەیەکی گەردوونی گچکە بە گەلەک ڕووناکیەوە کە لە لەتەگۆی باشووریدایە و چوار ئەستێرە گەشەکەی وەک چەلیپا دەنوێنن: **صلیب جنوبی**

◙ **صلیب جنوبی** ☜ **صلیب ـ٤**

**صلیب سرخ** ☜ **صلیب‌سرخ**

**صلیب شمالی** ☜ **قو ـ ١**

▣ **به صلیب کشیدن:** بە چوارمێخەدا کێشان؛ چوارنیخەکێشان؛ بە میخەوە کردنی دەست و پای کەسێک لە سەر خاچی هەڵدراو ‹عیسی را به صلیب کشیدند: عیسایان بە چوارمێخەدا کیشا›.

**صلیب‌سرخ** / salîbesorx/: [معرب/ فارسی]*اسم.* خاچی سوور: ۱. نیشانەیەک بە شێوەی خاچ (+) بە ڕەنگی سوور کە هێمای ڕێکخراوەیەکی بەم ناوەیە ۲. ڕێخراوەیەکی جیهانی کە کاری یارمەتی گەیاندن بە گەزەنگازانی شەڕ یان تەگەرەی سروشتیە ۳. هەر یەکە لە لقگەلی ئەو ڕێخراوەیە.

**صلیب‌شکسته** / salîb(e)šekaste/: [معرب/ فارسی] *اسم.* خاچی شکاو؛ نەخشێکی وەکوو خاچێکی بە دوو سەردا شکاو بەم شێوە 卐 کە لە نەخشگەلی جوانکاری هۆزگەلی کەونارادا زۆر باو بووە و لە دەکانی ۱۹۲۰ی زایینیدا بوو بە دروشمی نازیەکانی ئاڵمان.

**صلیبی** / salîbî/: [معرب] *صفت.* ۱. خاچی؛ سەلیبی؛ چەلیپایی؛ پێوەندیدار بە خاچەوە ۲. ـها؛ ـان/*/مجازی/* خاچپەرست.

**صماخ** / somāx/: [عربی]*اسم.* پردەی گوش ☜ **پرده**

**صمغ** / samq، ـها/: [عربی]*اسم.* جەوی؛ جەوگ؛ کەتیرە؛ هەنگویژە؛ هەنگوژە؛ زەمق؛ بەرەژ؛ گەرجن؛ ماکێکی لینجی بێبۆن و تامە لە قەد و لقی بڕێ درەخت و گیاوە دەگیردرێ، بە وشکی سفت و ڕەقە، بەلام لە تەڕایی و ئاودا چەسپنە.

**صمیم** / samîm/: [عربی]*اسم. /ادبی/* ناخ؛ کانگا؛ ناوجەرگە؛ بەشی ناوکی و بێگەردی هەر شتێ کە لە نێوانیدایە و تێکەڵ بە هیچی‌تر نیە.

◙ **از صمیم قلب:** */مجازی/* لە ناخی دڵەوە؛ لە کانگای دڵەوە؛ لە قووڵایی دڵەوە.

**صمیمانه**[1] / samîmāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* گەرم؛ گوڕ؛ بێگەرد؛ گەرم و گوڕ؛ بەتین ‹دوستی صمیمانه: دۆستایەتی گەرم›.

**صمیمانه**[2]: *قید.* گەرم و گوڕ؛ بەتین؛ لە سەر مێرەوانی و هاودڵیەوە ‹او را صمیمانه در آغوش کشید: گەرموگور گرتیە باوەشەوە›.

**صمیمی** / samîmî/: [عربی] *صفت.* یەکدڵ؛ هاودڵ؛ کۆک؛ جووت؛ نێوان‌خۆش؛ بەین‌خۆش ‹دوست صمیمی: دۆستی یەکدڵ›. هەروەها: **صمیمی بودن؛ صمیمی شدن**

**صمیمیت** / samîmîyyat، ـها/: [عربی]*اسم.* یەکدلی؛ هاودلی؛ هەڤڕەنگی؛ نێوان‌خۆشی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نێوان‌خۆش و تەبا بوون ‹کاری که کرد حاکی از صمیمیت بود: ئەو کارە کردی نیشاندەری یەکدلی بوو›.

**صنار** / sannār/ [فارسی/ یونانی از لاتینی] ☜ **صددینار**

◙ **صنار سه‌شاهی:** */گفتاری/* قەرە پووڵ؛ چوار قەران؛ پارەیەکی کەم و بێبایەخ ‹این صنار سەشاهی کە بە هیچ جای زندگی ما نمی‌رسد: ئەم چوارقەرانە خۆ بەش هیچێکمان ناکا›.

**صناری** / sannārî/ ☜ **صددیناری**

**صناعات** / sanā'āt, senā'āt/: [عربی] جمعِ ☜ **صناعت**

**صناعت** / sanā'at, senā'at، ـها؛ صناعات/: [عربی] *اسم. /ادبی/* پیشە؛ پیشەسازی ‹گفت: من این

صناعت دانم: گوتی: من ئەم پیشە دەزانم›.
**صنایع** / sanāye'/: [عربی] جمعِ ☜ **صَنعَت**
▣ **صنایع دستی**: پیشەی دەسکرد: ۱. پیشەی وا کە لە دەستی مرۆ و ئامێر و ماشینی ساکار کەڵک وەردەگیردرێ ۲. بەرهەمی وەها پیشەگەلێک.
**صنایع سبک**: پیشەسازی سووک؛ دامەزراوە و ڕێخراوەگەلێک کە بەرهەمی سووک و چکۆلەیان هەیە.
**صنایع سنگین**: پیشەسازی قورس؛ دامەزراوە و کارخانەگەلی بەدیهێنانی بەرهەمی گەورە وقورس (وەک فڕۆکەسازی).
**صنایع نظامی**: پیشەسازی چەکداری؛ پیشەگەلێک کە بە دروستکردنی ئامێری شەڕەوە خەریکن.
**صنج** / senc/: [معرب از فارسی] ☜ **سِنج**
**صندل** / sandal/:/سم. ۱. /ـها/ [فرانسوی] قاپقاپ؛ قاپقاپە؛ سۆل؛ چەشنێ پێڵاو بە تەختەیەک لە ژێر و سیرمێک لە سەرەوەی ۲. /ـها/ [معرب از سنسکریت] سەندەڵ؛ گینو؛ گێنۆ؛ درەختێ هیندی بە ڕەگ و ڕیشەی تاڵ-تاڵ و گەڵای نووکتیژی بەرامبەر یەک و گوڵی بچووکی کۆمەڵ و هێشووی درێژ و دەنکی سەوزەوە کە بۆ دەرمانی نەخۆشی دڵ باشە ۳. چێوی ئەو دارە کە تویژی دەرەوەی سپی و ناوەکەی لیمۆیی ڕەنگ و قورستر و چڕترە و بۆنێکی توند و خۆشی هەیە و بەنرخە.
**صندلی** / sandalî ، ـها/: [معرب]/سم. سەندەڵی؛ سەنگەڵی: ۱. ئەسکەمل؛ ئەسکەملە؛ ئەسکەملی؛ چواربەن؛ چواربەندە؛ روونشتەک؛ قورسی؛ کورسی؛ ئامێرێک بە پایەگەلێکەوە بۆ دانیشتنی یەک کەس بە سەریەوە ‹صندلی را پیش کشید و نشست: ئەسکەملەکەی هێنایە پێشەوە و لە سەری دانیشت› ۲. جێگای دانیشتن لە ناو ماشین، قەتار و وەک ئەوانەدا ‹صندلی مرا به یک نفر دیگر هم فروختەاند: سەندەڵییەکەی منیان بە کەسێکیتریش فرۆشتووە› ۳. /مجازی/ پلە و پایە ‹طوری به صندلی ریاست چسبیده که انگار ارث پدرش است: وەها پاڵی داوە بە سەندەڵی سەرۆکایەتیەوە ئێژی میراتی باوکیەتی›.
▣ **صندلی الکتریکی**: ئەسکەملی ئیلکتریکی؛ چەشنێ چواربەندی کانزایی بۆ کوشتنی تاوانباران، کە ڕەوتی بەهێزی کارەبای تێ دەخرێ.
**صندلی تاشو**: چەشنێ ئەسکەمل کە پێیەکانی و جێ دانیشتنەکەی لە سەر یەک قەد دەبن و ویکرا خڕ دەبێتەوە.
**صندلی تحصیلی**: جۆرێ سەندەڵی بە دەستەیێ پتر لە لای ڕاستەوە کە ڕووبەری سەرووی ئەو دەستەپانە و بە شێوەی مێزۆکەیێکە: **صندلی دستەدار**
**صندلی چرخان**: چەشنێ ئەسکەمل کە جێ دانیشتنەکەی لە سەر خولەکێک سوور دەخوا.
**صندلی چرخدار**: ئەسکەملی ڕەوڕەوەدار بۆ نەخۆشێ کە لە پێ کەوتووە.
**صندلی دستەدار**: ۱. چەشنێ ئەسکەمل کە لە لایەن ڕاست و چەپیەوە دەستەی هەیە و دەکرێ باسکی لە سەر دانێی ۲. ☜ **صندلی تحصیلی**
**صندلی راحتی**: جۆرێک ئەسکەمل بە نیشتنگە و جێپاڵی نەرمەوە.
**صندلی گردان**: چەشنێ ئەسکەمل بە پایەی چەرخدارەوە بۆ گواستنەوە.
**صندلی لهستانی**: ئەسکەملی لەهیستانی؛ جۆرێ سەندەڵی چێوین بە نشینگەی خڕ و چوارپایەی باریکەوە.
**صندوق** / sandûq, sandoq ، ـها/: [معرب از فارسی]/سم. سنووق؛ سندووق؛ سنۆق:

١. چەکمەزە؛ مەساهە ؛ مەساهە؛ خەزنە؛ مەحفەرە؛ جەعبەیەکی دەرگادار بۆ هەڵگرتنی شت یان پووڵ ‹صندوق لباس؛ صندوق پول: سنووقی گنج؛ سندووقی پارە› ٢. ڕێخراوەیەک بۆ پاشەکەوت، وام یان هورمی ماڵی ‹صندوق بازنشستگی؛ صندوق پس‌انداز: سندووقی وەنیشتەیی؛ سنووقی پاشەکەوت› ٣. شوێنی دان و گرتنی پارە لە ڕێخراوەیەکدا (وەک بانک) ‹پول را بدهید صندوق: پارەکە بدەن بە سنووق›.

◙ **صندوق پست**: سنووقی پۆست؛ سندووقێک کە نامەی پۆستی تێدەخەن.

**صندوق پستی**: سنووقی پۆستی؛ سنووقێک لە مەزرینگەی پۆستدا کە کارگێری پۆست، نامە گەیشتووەکانی بۆ تێدەخا تا خاوەن سندووق (کەس یان ڕێخراوەیەک) هەڵیگرێ.

**صندوق رأی**: سندووقی ڕا؛ سنووقی دەنگ؛ سنووقێک کە ئەوانەی کە دەنگ دەدەن، قاقەزی ڕای خۆیانی تێدەخەن.

**صندوق صدقات**: سندووقێک بۆ وەرگرتنی یارمەتی خەڵک لە جێگایەکی گشتی یان بوارگەیەکدا.

**صندوق عقب**: سنووقی دوا؛ جێگایەکی سندووقئاسا لە پشتەوەی ماشێنی سواری، بۆ دانانی شتومەک.

**صندوق نامه**: سندووقی نامە؛ سنووقێک لە بەر ماڵدا بۆ تێخستنی نامەی گەیشتوو بۆ دانیشتوانی.

**صندوق نسوز**: سنووقی نەسووز/ نەسۆچ؛ سندووقێکی پۆلایی کە لە بەرامبەر گڕ و تینی ئاورەوە بەرگە دەگرێ.

**صندوقچه** / sandûqče, sandoq- ، ـها/: [معرب/ فارسی]/اسم. مجری؛ سنۆقلە؛ سندووقی چکۆلە.

**صندوقخانه** / sandûqxāne, sandoq- ، ـها/: [معرب/ فارسی]/اسم. هێشخان؛ هێشخانە؛ پێشخان؛ وچخانە؛ هۆدە یان هەمارێکی چکۆلە لە ماڵ کە سندووق و جلوبەرگ و شتی بەبایەخی تێدا هەڵدەگرن.

**صندوقدار** / sandûqdār, sandoq- ، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی]/اسم. دەخڵدار؛ سنووقدار: ١. کەسێ کە بەرپرسی ئاگاداری لە پارە یان دەخڵی ڕێخراوەیەکە ٢. کەسێ کە لە فرۆشگەیێکدا، بایی شتومەکی فرۆشراو لە سەنیاران دەستێنێ.

**صندوقداری** / sandûqdārî, sandoq-/: [معرب/ فارسی]/اسم. دەخڵداری؛ سنووقداری؛ ئاگاداری لە پارەی ڕێخراوەیەک و دان و سانی پووڵ بەو کەسانەی کە لێیدەکەون.

**صندوقه** / sandûqe, sandoqe/: [معرب/ فارسی] اسم. ١. [قدیمی] پەراسووبەند؛ قەفسینگ؛ دەفەی سینگ؛ پەراسی ٢. ـها/ [معماری] دیواری ناوخالی؛ دیواری پووک.

**صنع** / son'/: [عربی]/اسم. [ادبی] چێ؛ ساز؛ دروست؛ درووس؛ خەلق؛ بەدیهێنەری؛ داهێنەری؛ کار و ڕەوتی بەدیهێنان؛ سێوراندن؛ خولقاندن؛ چێکرن.

**صنعت** / san'at/: [عربی]/اسم. پیشەسازی؛ کسب؛ کسپ؛ کسم؛ کرگار: ١. ـها؛ صنایع/ کاری بەرهەمهێنان کە بە شوێنگری لە ڕەوش، ئامۆژە و قانوونگەلی تایبەت بە خۆیەوە ئەنجام بدرێت ٢. شێوە و شێواز و بنەمای وەها کارێک ٣. کاری چێکراو بە ماشین و بە شێوەی گۆڕانی ماکی خاو بە پیتەوای دروستکراو.

**صنعتدار** / san'atdār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] اسم. خاوەن‌پیشە؛ کەس یان گرۆی خاوەن ڕێخراوەگەلی پیشەیی (وەک هێڵی ئاسن، کارخانەی ماشین‌سازی و...).

**صنعتکار** / san'atkār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. [گفتاری] پیشەساز؛ کەسێ کە ژیانی بە پیشەسازی بەڕێوە دەچێ.

**صنعتگر** / san'atgar ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. پیشەساز: ۱. کەسێ کە لەگەڵ شێوە و شێواز و بنەماگەلی پیشەیەکدا ئاشنایە ۲. کەسێ کە بە کارێکی پیشەسازی ژیانی بەڕێوە دەچێ.

**صنعتی** / san'atî/: [عربی] صفت. پیشەسازی: ۱. سەر بە پیشەسازیەوە ‹ماشین‌آلات صنعتی: ماشینگەلی پیشەسازی› ۲. خاوەن پیشە، بەتایبەت پیشەیێک بە ماشینی پێشکەوتوو بەڕێوە بچێ ‹شهرک صنعتی: شارۆچکەی پیشەسازی›.

**صنف** / senf ، ـها؛ صنوف؛ اصناف/: [عربی]/اسم. پۆل؛ دەستە؛ بەرە؛ هاوپیشە؛ کۆمەڵێ لە ئەندامانی پیشەیەکی دیاریکراو ‹صنف نجار؛ صنف نانوا: پۆلی چێوتاش؛ دەستەی نانەوا›.

**صنفی** / senfî/: [عربی] صفت. هاوپیشەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە پیشەیەک ‹فعالیت صنفی: چالاکی هاوپیشەیی›.

**صنم** / sanam ، ـها؛ اصنام/: [عربی]/اسم. [ادبی] بت؛ بوت؛ بتە؛ پت؛ پەیکەری مرۆ یان هەر شتێکی‌تر بە نیشانەی هێزی ئاسمانی.

**صنوبر** / senowbar, seno:bar ، ـها؛ ـان/: [معرب از یونانی]/اسم. نەوژ؛ نەوز؛ ناژین؛ ناز؛ ناژ؛ ناژوو؛ ناجوو؛ سنەوبەر؛ ناوی چەند جۆرە داری هەمیشە سەوزی سەردەسێرە بە گەشکەی خێراوە کە لە پیشەسازیدا لە چێوەکەی کەڵکی زۆر وەردەگرن.

**صنوبری** / senowbarî, seno:barî/: [معرب] صفت. نەوژی؛ ناژینی: ۱. سەر بە ناژینەوە ۲. وەکوو سنەوبەر.

**صنوف** / sunûf, sonûf/: [عربی] جمعِ ☜ **صِنف**

**صواب** / savāb ، ـها/: [عربی] صفت. [ادبی] دروست؛ درووس؛ ڕاست؛ ڕاس. بەرانبەر: **خطا** ‹فکر صواب: بیری دروست›.

**صوابدید** / savābdîd/: [عربی/ فارسی]/اسم. پەسند: ۱. کاری لێکۆڵینەوە لە دروستی و نادروستی، چاکی یان خراپی کارێک ۲. بیر و بروایەک کە بەم شێوە بگوترێ.

**صوب** / sowb, so:b/: [عربی]/اسم. [نامتداول] لا؛ لایەن؛ ئالی؛ سۆ؛ بەرەوگە؛ نک.

**صوت** / sowt, so:t ، ـها؛ اصوات/: [عربی]/اسم. دەنگ؛ دنگ: ۱. سەدا ۲. [فیزیک] وزەیەکی میکانیکی کە بە گوشاری شەپۆلی پەیتا- پەیتای درێژ لە شوێنێکدا (وەک هەوا) بڵاو دەبێتەوە ۳. [دستور] الف) وشەیەک کە خۆشحاڵی، تووڕەیی، سەرسووڕماوی، وەڕەزی و...ی بێژەر نیشان دەدا (وەک: بەهە، ئاخ، پەکوو ...) ب) وشەیەک کە نیشانەری دەنگێکە (وەک جیزەجیز، تەقەتەق).

**صوت‌شناسی** / sowtšenāsî, so:t-/: [عربی/ فارسی]/اسم. دەنگ‌ناسی؛ زانستی لیکۆڵینەوە لە چێ‌کردن، وەرگرتن، ڕاگواستن و شوێنەمای دەنگ.

**صوتی** / sowtî, so:tî/: [عربی] صفت. دەنگدار: ۱. دەنگی؛ پێوەندیدار یان سەر بە دەنگەوە ‹ارتعاش صوتی: لەرەی دەنگی› ۲. بە دەنگەوە ‹بمب صوتی: بومبی دەنگدار›.

**صور** / sovar/: [عربی] جمعِ ☜ **صورت**

**صور** / sûr ، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] ۱. شەیپوور؛ بۆق؛ شووت؛ ئامرازی ئاگادارکردنی دەنگدار ۲. بۆری؛ بۆریە؛ کەرەنا؛ تووتووک؛ مۆزیقا؛ سازێکی کانزایی گرۆڤەری درێژۆکەیە، بنەکەی هەراو دەبێتەوە، فووی پێدا دەکەن دەنگێکی گڕ و بەرزی لێ دێ.

◘ **صور اسرافیل**: سووری ئیسرافیل؛ شەیپوورێکە وەک دەڵێن لە ڕۆژی پەسڵاندا فریشتەیەک بە ناوی ئیسرافیل فوویەکی زۆر بە قەوەتی پێدا دەکا، هەموو مردووانی پێ زیندوو دەبنەوە.

**صورت** / sûrat/: [عربی]/اسم. ۱. [ـها] دەم و چاو؛ دەمچەو؛ ڕوو؛ دیم؛ دیمەن؛ ڕوخسار؛ چار؛ چێرە؛

ڕی؛ ڕوە؛ ئەو بەشە لە سەری گیانەوەر بەتایبەت مرۆ کە دەم، چاو، گۆنا و لووت دەگرێتەوە ۲. /ـها؛ صور/ شێوە؛ بیچم و پێکهاتەی شتێک کە لە ماکە خاوەکەی جویێ دەکاتەوە ‹سنگ را بە صورت آدم در می‌آورد: بەردی بە شێوەی مرۆ دەردێنا› ۳. [مجازی] شێواز؛ دۆخ؛ بار ‹برخوردش صورت بسیار زنده‌ای داشت: جوولانەوەی شێوازێکی زۆر ناحەزی بوو› ٤. /ـها/ [ریاضی] سەر؛ سەری کەرت؛ بەشی سەرووی هێڵی کەرت. بەرامبەر: **مخرج** ٥. ڕوالەت؛ بەشی دەرەوە و دیاری شتێک ‹صورت ماجرا این است، امّا حقیقت چیز دیگری است: ڕوالەتی ڕووداوەکە ئەمەیە، بەلام ڕاستیەکەی شتێکی ترە› ٦. /ـها/ سیایی؛ سیاهی؛ سیاهە؛ نووسراوەیەک کە چۆناوچۆنی کار یان ناو و نیشانی ماڵ یان کەسانێکی تێدا ڕاگەیەندراوە ‹صورت اموال؛ صورت دارایی: سیایی ماڵ؛ سیاهەی دارایی› ۷. / صوَر/ [قدیمی] وێنە؛ نیگار؛ سیما؛ بەتایبەت وێنەی چاری مرۆ ۸. [مجازی] بیچم؛ تەشک؛ تەژ ۹. سوورەت؛ سەر؛ وێنە لە وەرەقی کایەدا ۱۰. نەقش؛ نەخش؛ شکڵ؛ بیچمی بە دەستکێشراو ۱۱. [مجازی] ڕوومەتی خوشیک؛ دیمەنی جوان ۱۲. کەلەخ؛ پەیکەر؛ گۆڤدە ۱۳. [قدیمی] بت؛ بوت.

▣ **صورت جلسه** ☜ **صورتجلسه**

**صورت حساب** ☜ **صورتحساب**

**صورت ظاهر:** ڕوالەت؛ بیچم یان دۆخی دەرەوەیی ‹از صورت ظاهر نمی‌شود قضاوت کرد: ڕوالەت شەرت نیە›.

**صورت فلکی:** [نجوم] وێنە؛ کۆمەلەیەک لە ئەستێران کە بە پێی شێوەی ڕوالەتیان بە شتێک چواون و بەو ناوە ناویان نراوە (وەک هەژدیها، سەگ، ورچ و...).

**صورت مسأله:** ئەوەی گرنگی بابەت و پرسی لە بارەوە ڕوون دەکاتەوە و پەرسڤی نیازە.

**در صورتی کە:** ۱. هاتو؛ ئەگەر؛ ئەر؛ ئەگە؛ هەگە ‹در صورتی کە خواست برود، مانعی ندارد: هات و ویستی بڕوا، قەی ناکا› ۲. ئەگەرچی؛ کەچی؛ لە حاڵێکدا ‹نخواست بماند، در صورتی کە کار خوبی داشت: نەیویست بمێنێتەوە، ئەگەرچی کارێکی چاکیشی هەبوو›.

▣ **صورت برداشتن:** سیاهەگرتن؛ سیایی گرتن؛ نووسین و تەیارکردنی سیاهی لە شتانێک.

**صورت پذیرفتن:** [ادبی] ڕوودان؛ ئەنجام بوون؛ شەمیران؛ مەشان؛ قەدان؛ کودان؛ ئەنجامدران؛ بەگا ئامەی.

**صورت خوبی/ خوشی نداشتن:** [مجازی] جوان نەبوون؛ باش نەبوون؛ شیاو نەبوون؛ ناشیرین بوون (ی کار یان کردەوەیەک) ‹این موضوع را تمام کنید، صورت خوبی ندارد: ئەم بابەتە ببڕنەوە، جوان نیە›.

**صورت خود را با سیلی سرخ کردن:** [کنایی] لامل بە زیلە سوورەو کردن؛ کراس پشتوڕوو کردن؛ بە تێکۆشان و ڕەنجی زۆر هەژاری و نەداری خۆ نیشان نەدان.

**صورت دادن:** ۱. ئەنجامدان؛ قەدانەدن؛ کودانەدن؛ مەشاندن؛ شەمیراندن ‹کارش را صورت داد: کارەکەی ئەنجامدا› ۲. سیاهە دان؛ سیایی دان ‹صورت خرجهایی را کە کردە بود بە دستم داد: سیاهەی ئەو خەرجانەی کردبووی دا بە دەستمەوە›. هەروەها: **صورت گرفتن**

**صورت‌برداری** / sûratbardārî ، ـها: [عربی/ فارسی] /اسم. سیاهەگری؛ کار و ڕەوتی ڕیزکردنی پێرستی یەک‌بەیەکی بەشگەلی کۆمەلێک ‹صورت‌برداری از اموال شرکت: سیاهەگری لە دارایی شەریکە›.

**صورتجلسات** / sûratcalasāt/: [عربی] جمعِ ☜ **صورتجلسه**

**صورتجلسه** / sûrat(e)calase ، ـها؛ صورتجلسات/: [عربی] /اسم. نووسراوەیەک کە کورتەی ڕووداو یان

وت‌وویژی نێو دانیشتنێکی تێدا دەنووسن.

**صورتحساب** / sûrathesāb ، ـها/: [عربی]/اسم. نووسراوەیەک کە نرخی کالا و خزمەتگەلی سنراوی تێدا تۆمارکراوە.

**صورت‌سازی** / sûratsāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. ۱. [مجازی] بەڵگەتاشی؛ کارەڕەهاتی هەڵبەستنی بەڵگەی حەسابی ماڵی ‹کارپرداز ما دویست هزار تومان صورت‌سازی کرده بود: کارگێڕەکەمان دوو سەد هەزار تمەن بەڵگەتاشی کردبوو› ۲. [قدیمی] وێنەگەری؛ دیمەن‌کێشی؛ چارکێشی.

**صورتک** / sûratak ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ماسک؛ ماسکە؛ پۆشەنێک بە بیچمی ڕووی مرۆڤ یان حەیوان، کە زۆرتر لە کارناواڵ و نومایشدا بە سەر و چاویەوە دەبەستن.

**صورتگر** / sûratgar ، ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. [ادبی] نیگارڤان؛ نیگارکێش؛ وێنەکێش؛ وێنەگەر؛ نەقاش، بەتایبەت نەققاشێ کە چێرەی مرۆ دەکێشێ.

**صورتگری** / sûratgarî ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. [ادبی] وێنەکێشی؛ نیگارڤانی.

**صورت‌مجلس** / sûratmacles ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. گوزارشی فەرمی سەبارەت بە ڕووداوێک ۲. نووسراوەیێ کە هەموو ڕووداوی نێو کۆڕێکی تێدا دەنووسن.

**صورت‌وضعیت** / sûratvaz'îyyat ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. گوزارشێک لەمەڕ چۆنیەتی بەرەو پێش چوونی چالاکیەکی ساختومانی یان بەرهەمهێنەری ۲. نووسراوەیەک سەبارەت بە چۆنیەتی بار و دۆخی ڕێخراوەیەک.

**صورتی**[1] / sûratî ، ـها/: [عربی]/اسم. چێرەیی؛ چیرەیی؛ چێرە؛ حویل؛ کنووشک؛ کولکولی؛ پەمەیی؛ ئاڵی کاڵ؛ ئاڵی ئاچخ؛ ڕەنگی سووری کاڵ، تێکەڵێک لە سوور و سپی. هەروەها: صورتی‌رنگ

**صورتی**[2]: صفت. چێرەیی؛ چیرەیی؛ چێرە؛ حویل؛ کنووشک؛ پەمەیی؛ دووی؛ بە ڕەنگی چێرەییەوە.

**صوری** / sûrî/: [عربی] صفت. ۱. سووری؛ پێوەندیدار بە ڕواڵەتەوە ‹منطق صوری: مەنتیقی سووری› ۲. پێوەندیدار بە ڕواڵەتەوە ‹تعارفات صوری: خولکی ڕواڵەتی› ۳. ناڕاستی؛ درۆیی؛ درۆیینە؛ نەبەڕاست ‹معاملەی صوری: سەودای ڕواڵەتی›.

**صوفی** / sûfî ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. سۆفی؛ شوێنگری هەر یەکە لە ئایینگەلی سۆفیان.

**صوفیانه**[1] / sûfiyāne/: [عربی/ فارسی] صفت. سۆفیانە؛ وەک سۆفیگەل ‹زندگی صوفیانە: ژیانی سۆفیانە›.

**صوفیانه**[2]: قید. سۆفیانە؛ بە شێوەی سۆفیان ‹صوفیانه پشت پا به تعلقات دنیوی زد: سوفیانە پشتی لە بەندەواری دنیا کرد›.

**صوفیگری** / sûfîgarî/: [عربی/ فارسی]/اسم. سۆفیەتی؛ سۆفیگەری؛ ئامۆژەیەکی عیرفانی لە بارەی پەیوەندی خودا و مرۆڤ و ڕێگەی ناسینی خوداوە.

**صوفیه** / sûfîyye/: [عربی]/اسم. سۆفیان؛ سۆفیگەل؛ سۆفیێ؛ سۆفیەل؛ شوێنگرانی سۆفیەتی.

**صولت** / sowlat, so:lat/: [عربی]/اسم. [ادبی] ۱. شکۆ و گەورەیی؛ فەڕ و شکۆ؛ سام ۲. [قدیمی] سەختی؛ سەخڵەتی؛ سۆڵە؛ دژواری.

**صومعه** / sowme'e, so:me'e ، ـها/: [عربی] اسم. پەرستینگا؛ پەرستگا؛ بینایەک کە تەرکەدنیایان تێیدا دەژین ‹بیشتر صومعەهای چینی و ژاپنی در کوهستانها ساخته شده است: زۆرتری پەرستینگاکانی چینی و ژاپونی لە چیادا کراونەتەوە›.

**صهیونیست** / sahyûnîst ، ـها/: [فرانسوی] صفت.

سەهیۆنیست؛ پەیڕەو یان شوێنگری سایۆنیسم.

**صهیونیستی** / sahyûnîstî/: [فرانسوی] صفت. سەهیۆنیستی؛ پێوەندیدار یان سەر بە سایۆنیسمەوە ‹حکومت صهیونیستی: دەسەلاتداری سەهیونیستی›.

**صهیونیسم** / sahyûnîsm/: [فرانسوی]/سم. سەهیۆنیسم؛ بزووتنەوەی ڕەگەزپەرستی جوولەکە بۆ پێکهێنان و پەرە پێدان بە ولاتێکی یەهوودی لە فەلەستیندا.

**صیاد** / sayyād، ـها؛ ـان/: [عربی]/سم. ١. ماسیگر؛ ماسیگیر؛ ماسیڤان؛ ماساوگیر ٢. /قدیمی/ نەچیروان؛ نێچیرڤان؛ نچیرڤان؛ ڕاویار؛ ڕاڤیار؛ ڕاوکەر؛ ڕاوچی؛ سەیڤان؛ سەیاد.

**صیام** / siyām/: [عربی]/سم./ادبی/ بەڕۆژوویی؛ ڕۆژگەوانی؛ ڕۆژیەوانی؛ ڕۆچەوانی؛ کاری ڕۆژووگرتن.

**صیانت** / siyānat/: [عربی]/سم./ادبی/ چاودێری؛ ئاگاداریێ؛ پاسەوانی؛ کەتوانی؛ کاری پاراستن ‹قرار است در راه صیانت از جان و مال مردم بکوشند: بڕیار وایە لە ڕێگەی چاودیری لە گیان و مالی خەلکی بکۆشن›.

**صیت** / seyt, sît/: [عربی]/سم./ادبی/ ناوبانگ؛ دەنگان؛ ئاوازە؛ ناوداری ‹صیت شهامتش در همه جا پیچیده بود: ناوبانگی بوێری ئەو لە هەموو شوێنێکدا دەنگی دابۆوە›.

**صیحه** / seyhe/: [عربی]/سم./ادبی/ هاوار؛ هەرا؛ قاڵ؛ فەریا؛ داد.

**صید** / seyd/: [عربی]/سم. ڕاو؛ ڕاڤ؛ ڕاوە: ١. ڕاوەماسی؛ کار و ڕەوتی گرتن و ڕاوکردنی ئاوزی ‹صید ماهی: ڕاوی ماسی› ٢. ـها/ ئەوەی لە ئاوزیان کە ڕاو دەکرێ ‹امسال صید خوب نبود: ئەوساڵ ڕاو باش نەبوو› ٣. /قدیمی/ نەچیر؛ نێچیر؛ نچیر. هەروەها: **صید شدن؛ صید کردن**

**صیغه** / sîqe/: [عربی]/سم. ١. /شیعه/ سیغە؛ سێغە؛ لفگری کاتی بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ‹می‌گویند او را صیغه کرده است: دەڵێن سیغەی کردووە› ٢. ـها/ /شیعه/ سیغە؛ سێغە؛ سیغەیی؛ ژنێ کە بە شێوەی کاتی مارەیان کردبێ ‹یعنی حاضر شده صیغه‌ی او بشود؟: یانی ملی داوە ببێتە سیغەی ئەو؟› ٣. /اسلام/ وشە و زاراوەگەلێک کە گوتنی بۆ مارەکردن پێویستە ٤. ـها/ /دستور/ پێکهاتە ‹صیغه‌ی ماضی: پێکهاتەی ڕابردوو› ☜ **ساخت ـ ۴**

◘ **صیغه شدن**: /شیعه/ سیغە بوون؛ بوونە سیغە؛ بوونە هاوسەری کاتی پیاوێک.

**صیغه کردن**: /شیعه/ سیغەکردن؛ کردنە سیغە؛ ژنێ بە هاوسەری کاتی خۆ دەرهێنان.

**صیغه‌ای** / sîqe'î/: [عربی/ فارسی] صفت. /شیعه/ سیغەیی؛ سێغەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە سیغەوە. بەرانبەر: **عقدی** ‹زن صیغه‌ای ارث می‌برد؟: ژنی سیغەیی میراتی پێ دەگا؟›.

**صیفی** / seyfî، ـجات/: [عربی]/سم. شیناوەرد؛ تەڕەکاڵ؛ هەر یەکە لەو سەوزی و میوەیانە کە لە بێستان دەچێنرێن، زۆربەیان یەکساڵەن و زۆرتریش لە هاویناندا شین دەبن: **سیفی**

**صیفی جات** / seyfîcāt/: [عربی/ از عربی] جمعِ ☜ **صیفی**

**صیفی کاری** / seyfîkārî/: [عربی/ فارسی]/سم. تەڕەکاڵی: ١. شیناوەردی؛ بووسان‌کاڵی؛ کار و ڕەوتی تەڕەکاڵ کردن؛ کێڵان و چاندنی سەوزی و میوەی هاوینی ٢. ـها/ بێستان؛ بێسان؛ کیار؛ زەوینێ کە تەڕەکاڵییان تێدا کردووە. هەروەها: **صیفی‌کار**

**صیقل** / seyqal/: [عربی]/سم. ساو؛ بریقە؛ بریکە؛ خۆڵماڵ؛ زای؛ کار یان ڕەوتی بریقەدارکردنی شتێک. هەروەها: **صیقل خوردن؛ صیقل دادن**

**صیقلی** / seyqalî/: [عربی] صفت. بریقەدار؛ بریکەدار؛ بە ڕوویەکی ساف و لووس بە بۆنەی ساوینی زۆرەوە.

# ض

**ض** / z/: *حرف.* نیشانەی هەژدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی؛ ئەم پیتە عەرەبیە و لە وشە ڕەگەز عەرەبیەکانی زمانی فارسیدا بە کار دەڕوا و وەک «ز» دەخوێنرێتەوە.

**ضابط** / zābet ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/*سم.* کارگێڕ؛ ڕێخەر ‹ضابط دادگستری: کارگێری دادپەروەری›.

**ضابطه** / zābete ، ـها؛ ضوابط/: [عربی]/*سم.* حەساوکتاو؛ ڕەوشت و قانوونێ کە بۆ ئەنجامدانی کارێک یان بەڕێوە بردنی شوێنێک دانراوە.

**ضاد** / zād/: [عربی]/*سم.* ناوی هەژدەهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**ضارب** / zāreb ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/*سم.* لێدەر؛ قوتێن؛ دەستوەشێن؛ ئەوەی کە لە کەسێ یان شتێکی داوە ‹ضارب فرار کرد و تاکنون دستگیر نشده است: لێدەرەکە هەلات و تا ئێستا نەگیراوە›.

**ضاله** / zālle/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* لاڕێ؛ ڕێلێون؛ گومڕە؛ گومڕا؛ سەر لێ شێواو؛ ڕێگای ڕاست ونکردوو ‹فرقەی ضاله: دەستەی لاڕێ›.

**ضامن** / zāmen ، ـها/: [عربی]/*سم.* زامن: ١. دەستەبەر؛ دەستوەر؛ دانەبەر؛ بەرعۆدە؛ کەسێ کە لە لایەن کەسێکی ترەوە بڕیاری کارێک بدا ‹من ضامن می‌شوم بعد از این درسش را خوب بخواند: من دەبمە زامنی لە ئێستاوە وانەکانی باش بخوێنێ› ٢. زوانە یان گیرەیەک کە لە جوولە و جێبەجێ بوونی تیکەیەک لە ئامێرێکدا بەرگری دەکا ‹ضامن تفنگ؛ ضامن چاقو: زامنی تفەنگ؛ زامنی چەقۆ›.

▣ **ضامن بهشت و دوزخ کسی نبودن:** *[کنایی]* ئۆباڵی کەسێک وە ئەستۆ نەبوون؛ بە ئەستۆ نەگرتنی ڕەوشتی چاکە یان خراپەی کەسێک ‹آقاجان به تو چه مربوط است! مگر تو ضامن بهشت و دوزخ مردمی؟: کاکە گیان بە تۆ چی! مەگەر ئۆباڵی مەردم وە ئەستوی تویە؟›.

**ضامن دادن:** دەستەبەر دانان؛ زامن دانان؛ کەسێک بە ناو دەستەبەر ناساندن.

**ضامن شدن:** دەستەبەر بوون؛ زامن بوون؛ بڕیاری ئەنجامدانی کارێک لە لایەن کەسێکی دیکەوە.

**ضامندار** / zāmendār/: [عربی/ فارسی] *صفت.* زامندار؛ تایبەتمەندی شتێ کە زوانە یان گیرەیەکی ببێ بۆ بەرگری لە بزاوی نەویستراوی بەشێ لەو شتە ‹چاقوی ضامندار: چەقۆی زامندار›.

**ضایع** / 'zāye/: [عربی] *صفت.* خراپ؛ خراو؛ فیڕۆ؛ خەسار؛ زایە؛ بەترەف؛ بەتلاو؛ هەڕش؛ هەرز؛ هەدەر.

▣ **ضایع شدن:** مەرکین؛ خراپیان؛ لە کیس چوون؛ زایە بوون؛ بە فیڕۆ چوون؛ لە نێو چوون؛ ژ دەست چوون.

**ضایع کردن:** هەرماندن؛ هەڕشاندن؛ مەرکاندن؛ مەزاختن؛ بە خەسار دان؛ خراپ کردن.

**ضایعات** / zāye'āt/: [عربی]/*اسم.* ١. جمعِ ☜ **ضایعه** ٢. خەسارچوو؛ فەوتاو؛ لە کیس چووگ؛ لە دەس چووگ؛ خەراب بوو؛ ئەوەی کە خەسار بووە یان لە بەین چووە ‹ضایعات کاغذ: خەسارچووی کاغەز›.

**ضایعه** / zāye'e ، ـها؛ ضایعات/: [عربی]/*اسم.* ١. کارەسات؛ کار و ڕەهات؛ کارەڕەهات؛ ڕووداوێ کە دەبێتە هۆی لە دەسدانی شتێکی پربایەخ ‹ضایعەی جانگداز: کارەساتی دلتەزێن› ٢. زیان؛ خەسار؛ گەزن ‹ضایعەی سیل: زیانی لافاو›.

**ضبط** / zabt/: [عربی]/*اسم.* زەبت؛ زەوت: ١. کار یان ڕەوتی گلدانەوە؛ دەست بە سەردا گرتن و ڕاگرتنی شتێک ‹محتویات جیب متهم را ضبط کردند: ناوەرۆکی گیرفانی تاوانبارەکەیان زەوت کرد› ٢. ڕاگری؛ هەڵگری ‹بیچارە نمی‌توانست ادرارش را ضبط کند: فەقیرە نەیدەتوانی میزی خۆی ڕاگری› ٣. تۆمار؛ کار یا ڕەوتی گواستنەوەی دەنگ یان وێنە بۆ سەر ڕووپەڕ، شریت، فیلم یان کەرستەیەک بۆ مانەوەی ٤. ـها/*[گفتاری]* زەفتە؛ شریتە؛ ئامرازی تۆمارکردنی دەنگ.

▣ **ضبط صوت** ☜ **ضبط‌صوت ـ ٢**

**ضبط مغناطیسی:** تۆماری میغناتیسی؛ کار یان ڕەوتی تۆمارکردنی زانیاریگەل (بۆ کومپیۆتەر)، دەنگ یان بەرنامەیەکی تەلەڤیزیونی بە دروستکردنی نیشانە (سیگنال)ی مغناتیسی لە سەر شریت یان دیسکێک.

**ضبط صوت** / zabtesowt, -so:t/: [عربی]/*اسم.* ١. کار و ڕەوتی تۆمارکردنی دەنگ ٢. ـها/ شریتە؛ زەفتە؛ ئامرازی بلاوکردنەوە و تۆمارکردنی دەنگ بەسەر نەوارەوە.

**ضبط و ربط** / zabt-o-rabt/: [عربی]/*اسم.* ڕێک‌وپێکی؛ تەکووزی؛ دوزەنە.

▣ **ضبط و ربط کردن:** بەڕێوە بردن؛ گەڕاندن؛ سامان‌دان؛ سەرپەرشتی کردن؛ ئەوەپەسارنەی ‹بە تنهایی همەی کارها را ضبط و ربط می‌کند: بە تاقی تەنی هەموو کارەکان بەڕێوە دەبا›.

**ضبطی** / zabtî/: [عربی] *صفت.* گیراو ‹حراج کالاهای ضبطی: هەڕاجی کالا گیراوەکان›.

**ضجه** / zacce ، ـها/: [عربی]/*اسم.* نالە؛ زەنازەنا؛ کارەکار؛ گوڕەگوڕ؛ کولسووز؛ کڕووزە و نووزە؛ کەوگری؛ شین و زاری بە دەنگی بەرز.

▣ **ضجه زدن:** کالین؛ زارین؛ زاریان؛ زمیهتن؛ زمین؛ زمایش؛ ڕۆ ـ ڕۆ کردن؛ بە دەنگی بەرز شین و شەپۆڕکردن ‹دخترش طوری ضجه می‌زد کە دل آدم کباب می‌شد: کچەکەی وەها دەکالی دڵی بۆ دەهاتە سۆ›.

**ضخامت** / zexāmat, zaxāmat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ئەستووری؛ ستووری؛ کولوفتی؛ کلفتی؛ گازرە؛ گازەرە؛ گازارە ‹ضخامت میله را اندازه گرفت: ئەستووری میلەکەی پێوا›.

**ضخیم** / zaxîm/: [عربی] *صفت.* ئەستوور؛ ستوور؛ قۆڵ؛ قایم؛ کلفت؛ کولوفت؛ بە گازەرە؛ بە کۆتەرەی زۆرەوە ‹کتاب ضخیم؛ پارچەی ضخیم: کتێبی ئەستوور؛ پارچەی قایم›.

**ضد**[1] / zed(d) ، ـها؛ اضداد/: [عربی] *صفت.* دژ؛ دش؛

زوج: ١. نەیار ‹با خواهرشوهرش ضد است: دژی دوشەکەیە› ٢. ناتەبا؛ ناسازگار؛ دژوەر ‹نور و ظلمت ضد یکدیگرند: رووناکی و تاریکی دژی یەکن› ٣. *[ادبی]* دانستەی وشەیەک کە دوو واتای لێک ناتەبای هەبێ، وەک «قەفاندن» کە بە واتای «پەنا دان» و «پەنا نەدان»ە.

**ضدـ**[٢]: *پێشواژە.* دژەـ ؛ دژـ ؛ دژوەر؛ دژبەر: ١. بەرگر؛ پێشگر ‹ضدآب؛ ضدزنگ: دژەئاو؛ دژەژەنگ› ٢. ـ بڕ؛ لە نێو بەر ‹ضدتانک؛ ضددرد: دژەدەبابە؛ ئێش‌بڕ› ٣. نەیار؛ نەساز؛ ناکۆک؛ ناتەبا ‹ضدّ اجتماعی؛ ضدّ انقلاب: دژکۆمەڵگا؛ دژەشۆڕش›.

▣ **ضد آب:** دژەئاو؛ دژ بە ئاو؛ بە تایبەتمەندی خراپ نەبوون بە هۆی شێ یان ئاوەوە و هەروەها تێکەڵ نەبوون دەگەڵ ئاودا.

**ضد اجتماعی:** دژ بە کۆمەڵگا؛ دژکۆمەڵگا؛ دژە کۆمەڵ؛ زیاندار بۆ کۆمەڵگا یان ناتەبا دەگەڵیدا ‹رفتار ضد اجتماعی: ئاکاری دژ بە کۆمەڵگا›.

**ضد حمله:** بەرپەرچ؛ پەلاری بەرامبەر بە پەلاماری دژمن.

**ضد درد:** دژەژان؛ ئێش‌بڕ؛ ژان‌بڕ.

**ضد زنگ:** دژەژەنگ؛ بە تایبەتمەندی بەرگری لە ژەنگ بردن.

**ضد عفونی:** گەماربەری؛ کار و ڕەوتی پاکەوە کردن و لەناو بردنی پیسی و گەماری شتێ.

**ضدعفونی کننده:** پیسی‌بەر؛ گەماربەر؛ لەناو بەری پیسی و پۆخڵی.

**ضد نور:** ڕووبەنوور؛ بە شێوەیەک، لەبەر نووری بە قەوەت (وەک تاو) لێدان، تەنیا سێبەرێک ڕەش لە شتەکە دیاربێ.

**ضد و نقیض** ☜ **ضدّ و نقیض**

**ضدّ و نقیض** / zed-o-naqîz/: [عربی] *صفت.* دژ بە یەک؛ بە تایبەتمەندی چەند دیاردە لە ئاست یەکتریدا، کە بە هەبوونی یەکیان ئەوی دیکەیان نەتوانێ ببێ (وەک: شەو و ڕۆژ) ‹سخنان ضدّ و نقیض: قسەگەلی دژ بە یەک›.

**ضدّیت** / zeddîyyat ، ـها/: [عربی]*اسم.* دژایەتی: ١. نەیاری؛ دژمنی؛ دوژمنی؛ دژمنایەتی ‹همیشه با او ضدیت می‌کرد: هەمیشە دەگەڵیدا دژایەتی دەکرد› ٢. بەرهەڵستی؛ ناتەبایی؛ ناکۆکی؛ نەسازی ‹ضدّیت نور و ظلمت یا گرما و سرما در ذات آنهاست: دژایەتی ڕۆشنایی و تاریکی یان گەرما و سەرما لە ناخیاندایە›.

**ضرابخانه** / zarrābxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* شوێنێ کە سکە لێدەدەن؛ جێگایەک کە پارەی کانزایی تێدا دروست.

**ضرایب** / zarāyeb/: [عربی] جمعِ ☜ **ضریب**

**ضرب** / zarb/: [عربی]*اسم.* ١. *[ادبی]* کار یان ڕەوتی لێدان ‹ضرب و جرح: لێدان و برین› ٢. *[گفتاری]* زەرپ؛ وێکەوتی هێندێک بەهێز ‹با ضرب خورد بە پیشانی‌ام: بە زەرپەوە کوتایە تەوێڵمدا› ٣. *[گفتاری]* زەبر؛ وزەیەک کە بۆ دابین‌کردنی ئامانجێک بە کار دەڕوا ‹به ضرب پول دیپلم گرفت: بە زەبری پارە دیپلۆمی گرت› ٤. *ـها/[موسیقی]* زەرب؛ تەپڵ؛ دمەک؛ لە سازە زەربیەکان بە وێنەی گۆزەیەکی گەورە، کە بنەکەی بە پێستێکی ناسک داپۆشراوە و بە پێدا ماڵینی ئەنگوست دەژەنرێ ٥. *ـها/[ریاضی]* لێکدان؛ یەکێک لە چوار کردەوەی سەرەکی لە بیرکاریدا (وەک: ٢٠=٥×٤) ٦. *[موسیقی]* زەرب؛ زەربەگەلی ئاهەنگین یان کارگەلی فیزیکی وەک یەک ‹آهنگ مارش دارای دو ضرب است و به آن دوضربی می‌گویند: ئاهەنگی مارش دوو زەربی هەیە و دووزەربی پێ دەڵێن› ٧. کار و ڕەوتی سکە لێدان؛ دروست‌کردنی پارەی کانزایی.

▣ **ضرب شست:** *[کنایی]* شەقەی قەڵماسک؛

کاریٚ کە بە مەبەستی خەسارگەیاندن بە کەسێک و نیشاندانی هێز و توان بیٚ.

**ضرب و جرح** ☜ **ضرب‌وجرح**

**ضرب و شتم** ☜ **ضرب‌وشتم**

⊡ **ضرب چیزی را گرفتن:** بەر زەربی شتیٚ گرتن؛ لە تەوژم و گوشاری زەرپی شتێک کەم‌کردنەوە.

**ضرب دیدن:** زەرب دیتن؛ کوتیان؛ کوتریان؛ بە هۆی زەربەوە تووشی کوتراوی بوون ‹خوردم زمین و پایم ضرب دید: کەوتم و پێم زەربی دیت›.

**ضرب کردن:** ١. لێکدان؛ ئەنجامدانی کردەوەی زەرب ‹عددی را در عددی ضرب کردن: لێکدانی ژمارەیەک لە ژمارەیەکی‌تر› ٢. سکە لێدان؛ دروست کردنی پارەی کانزایی ‹بانک سکەهای ٥٠ تومانی ضرب کردە است: بانک سکەگەلی ٥٠ تمەنی لیداوە›. هەروەها: **ضرب شدن**

**ضرب گرفتن:** تەپڵ لێدان؛ بە لێدانی قامکان لە سەر شتیٚ، دەنگیٚ ئاهەنگین بەدیهێنان.

**ضربات** / zarabāt/: [عربی] ١. جمعِ ☜ **ضربە** ٢. جمعِ ☜ **ضَربت**

**ضربان** / zarābn/: [عربی]/اسم. تەپە؛ خورپە؛ کوتە؛ چڵ؛ چلک؛ پل؛ چۆناوچۆنی لێدانی پەیتاـپەیتا و زۆر جاران بە مەوداگەلێکی کاتی و تەوژمی بەرامبەرەوە ‹ضربان قلب: تەپەی دڵ›.

**ضرب‌الاجل** / zarbol'acal ، ـها/: [عربی] /اسم. وادە؛ مۆڵەت؛ ماوەیەکی دیاریکراو کە پێویستە بەر لە دوایی هاتنی کارێک بە ئەنجام بگات ‹ادارەی دارایی برای پرداخت مالیات تا پایان تیرماه ضرب‌الاجل تعیین کردە است: مەزرینگەی دارایی بۆ دانی مالیات تا ئاخری پووشپەڕ وادەی داناوە›.

**ضرب‌المثل** / zarbolmasal ، ـها/: [عربی] /اسم. پەند؛ مەتەڵۆکە؛ قسەی نەستەق موچیاری یان وتەیەکی مانادار کە لە نێو خەڵکدا بۆتە باو ‹«سیلی نقد بە ز حلوای نسیە»، یک ضرب‌المثل است: «هەشت بیٚ لە مشت بیٚ، نەک نۆ بیٚ نەبیٚ»، پەندێکە›.

**ضرباهنگ** / zarbāhang ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. ریتم؛ زەرب؛ کوتەی ئاهەنگ.

**ضربت** / zarbat ، ـها؛ ضربات/: [عربی] /اسم. زەربەت: ١. زەبر؛ زەرپان؛ لیخەک؛ دەرب؛ کار یان ڕەوتیٚ کە دەبێتە هۆی وێکەوتی کوتوپڕی بە تەوژمەوە ‹ضربت زدن: زەربەت لێدان› ٢. زام؛ شوێن؛ ئالگ؛ شوێنی لێدان ‹ضربت شمشیر؛ ضربت چاقو: زام شمشێر؛ شوێنی چەقۆ›.

⊡ **ضربت خوردن:** زەربەت خواردن؛ زەبر لێکەوتن؛ کەوتنە بەر زەربەوە.

**ضربت زدن:** زەربەت لێدان؛ وەشاندن؛ گۆزانن؛ بە تەوژم لێدان ‹زدی ضربتی، ضربتی نوش کن!: زەربەتیکت وەشاند، سا یەکیٚ بگرە خۆت!›.

**ضربتی** / zarbatî/: [عربی] قید. [مجازی] گورچوبڕ؛ گرچوبڕ؛ دەم و دەست؛ بە پەلە و بیٚ خاوەخاو ‹برای ریشەکن کردن بیسوادی باید ضربتی عمل کرد: بۆ بنەبڕکردنی نەخوێندەواری دەبیٚ گورچوبڕ کار بکریٚ›.

**ضربدر** / zarbdar ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. زەربدەر؛ چوارخاڵ؛ دوو کێڕی یەکتر بڕی وەک ئەم نیشانە: (×).

**ضربدری** / zarbdarî/: [عربی/ فارسی] صفت. زەربدەری؛ چوارخالی؛ خاوەن دۆخ یان چۆنیەتیەکی یەکتربڕ (وەکوو نیشانەی زەرب: ×).

**ضربدیدگی** / zarbdîdegî/: [عربی/ فارسی]/اسم. کوتراوی؛ کوتیاوی؛ کوتیاگی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی کەوتنە بەر زەربەوە ٢. /ـها/ ئاسەواری

زەربـەت؛ شـوێنی زەربـە ‹بـر روی سـرش یـک ضربدیدگی وجود داشت: لە بان سـەریەوە کوتراویـەک هەبوو›.

**ضربگیر** / zarbgîr ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. دمەکـژەن؛ زەربژەن؛ ژەنیاری زەرب.

**ضرب‌وجرح** / zarb-o-carh/: [عربی]/اسم. شـەل و پەت؛ شەل و کوت؛ کـار یـان ڕەوتی لێـدان و بریندارکردن؛ لێدان و زامار کردن.

**ضرب‌وشـتم** / zarb-o-šatm/: [عربـی]/اسم. کـار یان ڕەوتی لێدان وەبەر جنێودان.

**ضربه** / zarbe ، ـها؛ ضربات/: [عربـی]/اسم. زەرپ: ۱. زەربـــە؛ زەربـــەت؛ وێکـــەوتی کـــوت‌وپـــڕ و هێندێک گومڕەی شـتێ دەگـەڵ شـتێکی‌تـردا ‹ضربەی چوب؛ ضربەی سنگ: زەربەی چێو؛ زەربـەی بەرد› ۲. [مجازی] تەوەرە؛ گرگاشە؛ لەتمە؛ کەت؛ ڕووداوی ناخۆش و دڵتەزین ‹مـرگ بـرادر بـرایش ضربەی سـختی بـود: مـەرگی براکـەی تەوەرەیـەکی گەورە بوو بۆی›.

◻ **ضربەی فنی** ☜ **ضربەفنّی**

**ضـربەفنـی** / zarbefanî/: [عربـی]/اسم. تـەختی زەوی: ۱. چۆنیـــەتی پـــشت دانـــە زەوی؛ حاڵـەتێک لـە زۆرانـدا کـە وەرزشـکار پـشتی هەڤـبەرەکەی لـە زەمـین بـدات ۳. حاڵـەتێ لە مـشتێندا کـە یـاریزان هەڤـبەرەکەی بخاتـە زەویـــن و ئـــەویش نـــەتوانێ لـــە وادەی دیاریکراودا هەڵسێتەوە.

**ضربه‌گیر** / zarbegîr ، ـها/: [عربـی/ فارسـی]/اسم. زەربـــەتگـــر؛ زەربـــەگیر؛ کەرەســـەیەک لـــە دەزگایەکدا بۆ لە ناو بـردنی ئاسـەواری زەربـە و بەرگری لە خراوی.

**ضربی**[1] / zarbî ، ـها/: [عربی]/اسم. دمـەکـژەن؛ زەربژەن.

**ضربی**[2]: صفت. زەربی: ۱. لـەبار بـۆ ژەنـدن بـە زەربـــە (وەک زەرب، دمـــەک، دەف، ســـنج و...) ‹ســاز ضـربی: ســـازی زەربی› ۲. بـــە زەربـــەوە ‹آهنـگ ضـربی: ئاهــەنگی زەربی› ۳. ســرمیچی وا کە لـە ئـاجۆر یـان بـەرد، بـە شـێوەی کـووڕ لێدراوە.

**ضرر** / zarar ، ـها/: [عربـی]/اسم. زیـان؛ خەسـار؛ خوسار؛ زەهی؛ زەرەر؛ زەرەد.

◻ ضرر دادن: زەرەر دان؛ زیان دان؛ خەسار بـار هێنان ‹این کار بهٔ جای سود، سالی یـک میلیـون ضرر می‌دهد: ئەم کارە بـە جێـی قـازانج، ساڵـێک یەک میلیۆن زەرەر دەدات›.

ضرر داشتن: زیـان هـەبوون؛ زەرەر هـەبوون؛ خراو بوون؛ زیاندار بوون ‹خربزه برایت ضرر دارد: کاڵەک بۆت زیانی هەیە›.

ضـرر دیـدن: زیـان لێکـەوتن؛ زیـان دیـتن؛ زەرەرکردن ‹از این کار ضرر می‌بینـی، نکـن!: لـەم کارە زیانت لیدەکەوی، مەکە!›.

ضـرر زدن: زیـانگەیانـدن؛ زیـان لێـدان؛ زەرەرگەیاندن ‹سیگار به سلامت ما ضرر مـی‌زنـد: جگەرە زیان دەدا لە ساغیمان›. هەروەها: **ضـرر رساندن؛ ضرر کردن**

**ضرور** / zarûr/: [عربی] ☜ **ضروری**

**ضـــرورت** / zarûrat ، ـهـــا/: [عربـــی]/اســـم. پێویستی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی پێویـست بـوون ‹ضـــرورت توجـــه بـــه تربیـــت صـــحیح فرزنـــدان: پێویـــستـــی ســـەرنج دان بـــە پـــەروەردەکردنی دروستی مندالان›.

◻ **ضرورت داشتن**: پێویست بوون؛ بە نیاز بـوون ‹حضور پزشک در آن موقع ضـرورت داشـت: بـوونی بژیشک لەو کاتەدا پێویست بوو›.

**ضــــروری** / zarûrî/: [عربـــی] صـــفت. ۱. /ـــهـــا/ پێویـــست؛ پێداویـــست؛ تـــەوزی ‹کمکهـــای ضـروری بـە آسـیب‌دیـدگان انجـام گرفـت: یارمـەتی پێویست بـە زیـانلێکـەوتوان گەیـشت› ۲. [ادبی] ناچار؛ ناعیلاج ‹چـو نتـوان بـە افـلاک دسـت‌آختن/ ضروریـست بـا گردشـش سـاختن: ئەگـەر دەسـتت ناچێ فەلەک کـەوی‌کـەی/ ناچـاری چۆنـت سـووڕ

دەدا، سوور بدەی›: **ضرور**

**ضـــروريات** / zarûrîyyāt/: [عربـــی]/اســـم. پێداویستیگەل؛ پێویستیگەل؛ ئـەوەی پێویـست بێ ‹ضروريات يک زنـدگى سالم: پێداویـستیگەلـی ژیانێکی پاک›.

**ضـريب** / zarîb ، ـهـا؛ ضـرايب/: [عربـی]/اسم. بـــەرەنجام: ١.[رياضـــی] ژمـــارە، یـــان پیتگـــەلێکی نـــەگۆڕ کـــە بـــەر لـــە ڕستـەیەکی جەبری دەنووسرێ و دەبـێ لـەودا لێـک‌بـدرێ (وەک ژمـــارەی ٢، لــــە ڕســـتەی (x+y) ٢ دا) ٢.[فيزيـک] ژمـارە یـان چەندیەتیـەک کـە تایبەتمەندیـەکی دیـاریکراو لـە مـاک یـان دەزگایەکـدا نیـشان دەدا و لـە بـار و دۆخێکـی بـــەرچاودا ئەندازەکـــەی نـــەگۆڕە ‹ضـــريب حرارتی: بەرەنجامی گەرمی›.

**ضـريح** / zarîh ، ـهـا/: [عربـی]/اسم. شـباک؛ شـــەباک؛ قـــسن؛ خـــزن؛ سەرپۆشـــی بـــە پەنجـــەرەی ســـەر گـــۆڕی چاکـــان و پاکـــان ‹ضـــريح «پيرشـــاليار» در اورامـــان: شـــباکی «پیرشالیار» لە هەورامان›.

**ضـريع** / zarî'/: [عربی]/اسم. جۆرێـک شـانەی پەیوەنـدی کـە دەرەوەی هـەموو ئێـسقانەکانی لەش دادەپۆشێ و توانایی ئێسک‌سازیشی هەیە.

**ضظغ** / zazeq/: [عربی]/اسم. نـاوی هەشـتەمین گـرۆی پیتـەکانی ئەبجـەد ☜ حـساب ابجـد، **حساب**

**ضـــعف** / za'f ، ـهـا/: [عربـــی]/اســـم. لاوازی؛ کـــزی: ١. بـــێ‌هێـــزی؛ خـــالیس؛ دۆخ یـــان چۆنیـــەتی نـــەبوونی توانـــایی پێویـــست ‹ضـعف بینـــایی؛ ضـــعف مـــدیریت: کـــزی بینـــایی؛ لاوازی بەڕێوەبەرایـــــەتی› ٢. درزانـــــگ؛ چالەمـــــە؛ هەست‌کـردن بـە بـێ‌حالـی، ماندوویـەتی، بـێ قـــەوەتی یـــان ســـەرگێژە بـــە هـــۆی ئـــێش، نەخۆشـــی، برســـیەتی، یـــان ڕاچـــڵەکانەوە.

هەروەها: **ضعف داشتن؛ ضعف کردن**

◙ **ضعف ريال**:[کنایی] دەسـتەنگی؛ بـێ‌پووڵـی؛ دەسکورتی ‹امسال به علت ضعف ريال براى بچه‌ها لبـــاس عيـــد نخريـــديم: ئەمـــساڵ بـــە هـــۆی دەستەنگیـــــەوە جـــلوبـــەرگی جـــەژنمان بـــۆ منداڵەکان نەکڕی›.

**ضـــعف** / ze'f ، اضـعاف/: [عربـی]/اسم.[نامتـداول] دووبەرابەری؛ دووئەوندەیی؛ دۆخ یان چۆنیـەتی دووبەرابەر بوون.

**ضعفا** / zo'afā/: [عربی]/اسم. هـەژاران؛ نـەداران؛ دەس‌تەنگان؛ دەس‌کورتیەل؛ بێ‌ئەنوایان ‹ضعفا از گرانى بيشتر آسيب مى‌بينند: هەژاران لە گـرانی زۆرتـر زیان دەبینن›.

**ضـــعيف** / za'îf/: [عربـــی] صـــفت. ١. ســـست؛ شـــل؛ شـــەوێق؛ بـــە پتەویـــەکی زۆر کەمـــەوە ‹اين پايه‌ها ضعيف است و پـل را نگـه نمـى‌دارد: ئـەم کلانـــە سستـــن و پێـــڵەکە ڕانـــاگرن› ٢. کـــز؛ لاواز؛ کـــەمهێـــز ‹فکـر ضـعيف؛ نويـسنده‌ی ضـعيف: بـــیری کـــز؛ نووســـەری لاواز› ٣. کـــز؛ کـــەم؛ بـــە گوشـــار و تـــەوژمی هندکـــەوە ‹نـــور ضـــعيف: تیـــشکی کـــز› ٤. لـــان/ لاواز؛ کـــز؛ درزانـــگ؛ کـــەمهێـــز یـــان گـــەزنگاز ‹بـدن ضـعيف؛ صـدای ضـــــعيف: لەشـــــی لاواز؛ دەنگـــــی کـــــز› ٥. دەس‌تـــەنگ؛ دەس‌کـــورت؛ هـــەژار؛ نـــەدار؛ بـــێ‌ئـــەنوا ‹آدم ضـعيفى اسـت، قـدرت خريـد چنـين خانـــه‌ای را نـــدارد: مرۆیـــەکی دەس‌تەنگـــە، دەســـەلاتی ســـەندنی وەهـــا خانوویـــەکی نیـــە›.

هەروەها: **ضعيف بودن؛ ضعيف شدن**

**ضـعيف‌البنيـه** / za'îfolbonye/: [عربـی] صفت. لاواز؛ لەڤاز؛ لەڕ؛ بێوەری لە لەش ساغی و هێزی پێویست.

**ضـعيف‌الـنفس** / za'îfonnafs/: [عربـی] صفت. بێ‌وره؛ کەمدڵ؛ وازوازی.

**ضـعيف‌کـش** / za'îfkoš ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] صفت.[مجـازی] بێدەس‌کوژ؛ بێکەس‌کوژ؛ خـاوەن خوو و خدە یان ئۆگرەتی بە ئـازاردانی کەسـانێ

که توانایی بەرهەڵستی و خۆپاراستنیان نیە.
هەروەها: **ضعیف‌کشی**

**ضعیفه** / za'îfe ، ـها/: [عربی]/اسم. [کنایی، قدیمی] زایفه؛ ئافرەت؛ ژن ‹ضعیفه! چادرت را جمع کن: زایفه! چارشێوەکەت کۆ وەکە›.

**ضعیفی** / za'îfî/: [عربی]/اسم. بێ‌هێزی؛ کزی؛ لاوازی؛ درژانگی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بێ قەوەت و لاواز بوون ‹از شدت ضعیفی نمی‌توانست از جایش بلند شود: لە بەر بێ‌هێزی زۆر نەیدەتوانی هەستێتەوە›.

**ضغطه** / zoqte/: [عربی]/اسم. [پزشکی] لێواوی؛ لێویاگی؛ شلەقیاگی؛ زیانی سەختی مێشکی کە دەبێتە هۆی تێکچوونی ئاوەز.

**ضلالت** / zalālat ، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] لاڕێیی؛ گومڕایی.

**ضلع** / zel' ، ـها/: [عربی]/اسم. لا: ١. /اضلاع/ [هندسه] پەل؛ ئالی؛ پاڵ؛ لەتە هێڵێ کە دەگەڵ لەتە هێڵێکی تردا سووچێک دروست دەکەن ٢. سنوور یان لایەکی پاڵدەستی شوێنێک ‹بازی در ضلع شرقی میدان ادامه داشت: یاریەکە لە لای رۆژهەلاتی مەیداندا درێژەی هەبوو›.

**ـــ ضلعی** / zel'î/: [عربی] پیوازه. ـــ لایی؛ ـــ پەلی ‹چهارضلعی؛ چندضلعی: چوارلایی؛ چەندپەلی›.

**ضمائر** / zamā'er/: [عربی] ☜ **ضمایر**

**ضمائم** / zamā'em/: [عربی] ☜ **ضمایم**

**ضماد** / zamād, zemād ، ـها/: [عربی]/اسم. مەڵهەم؛ ئاوکوت؛ هەر یەکە لە دەواگەلی هەویرئاسا کە بۆ لابردنی ئێش یان کوتراوی، دەیخەنە سەر شوێنی ئێشەوە.

**ضمان** / zemān, zamān/: [عربی]/اسم. ١. دەستەبەری؛ دەستەوەری؛ کار یان ڕەوتی دەستەبەر بوون ٢. وەخۆگرتوویی؛ وەئەستۆگری؛ کار و ڕەوتی وە ئەستۆگرتنی تاوانێ کە کەسێک بە کەسێکی تری گەیاندووە.

▣ **وجه ضمان** ☜ **وجه**

**ضمانت** / zemānat, zamānat/: [عربی]/اسم. ١. دەستەبەری؛ دەستەوەری ‹حاضری ضمانت او را به عهده بگیری؟: ئامادەی دەستەبەری ئەو بگریتە ئەستۆ؟› ٢. /ـها/ دابین؛ کار یا ڕەوتی مسۆگەر کردن ‹من ضمانت می‌کنم: ئەمن دابینی دەکەم›.

▣ **ضمانت اجرا**: دەستەبەری بە ڕێوە چوون ‹ضمانت اجرای این قانون چیست؟: دەستەبەری بەڕیوە چوونی ئەم قانوونە چیە؟›.

▣ **ضمانت کردن**: وە ئەستۆگرتن؛ دەستەبەر کردن بۆ بەڕێوە چوونی بڕیارێ.

**ضمانت‌نامه** / zemānatnāme, zamānat- ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. دەستەبەرنامە؛ نووسراوەیەک کە بە پێی ئەوە کەس یان دامەزراوەیەک بەڕێوە چوونی کارێک وە ئەستۆ دەگرێ ‹ضمانت‌نامەی بانکی: دەستەبەرنامەی بانکی›.

**ضمایر** / zamāyer/: [عربی] جمعِ ☜ **ضمیر: ضمائر**

**ضمایم** / zamāyem/: [عربی] جمعِ ☜ **ضمیمه: ضمائم**

**ضمن** / zemn/: [عربی] حرف. دەگەڵ؛ لەگەڵ؛ لەتەک؛ وێڕا؛ هاوڕێ؛ لەل؛ پێڕا؛ چنی؛ چەنی؛ لە پاڵ؛ پێکرا؛ تێکرا؛ هاوکات و لە نێوان کارێک یان ڕووداوێکدا ‹ضمن کار؛ ضمن سلام: دەگەڵ کار؛ وێرای سەلام›.

**ضمناً** / zemnan/: [عربی] حرف. هەروەها؛ هەر بەم جۆرە؛ هەر بەم چەشنە؛ هەر پاسە ‹ضمناً آزاد هم قرار است بیاید: هەروەها ئازادیش بڕیارە بێت›.

**ضمنی** / zemnî/: [عربی] صفت. وێڕایی؛ پێڕایی؛ دانراو لە نێوان شتێکی دیکەدا

‹اشارەای ضمنی بە طلبش کرد: ئاماژەیەکی ویرایی بە قەرزەکەی کرد›.

**ضمه** / zamme/: [عربی] ☜ **پیش**[1]

**ضمیر** / zamîr ، ـها؛ ضمایر/: [عربی]/اسم. ١. دەروون؛ بیر ‹ضمیر پاک؛ ضمیر روشن: دەروونی خاوێن؛ بیری ڕوون› ٢. هزر؛ بیر؛ هێزی زەینی، فیکری و مێشکی ٣./دستور/ جێناو؛ ڕاناو؛ هێما بۆ ناو لە ڕێزماندا ‹ضمیر اشارە؛ ضمیر ملکی: جێناوی ئاماژە؛ جێناوی خاوەنداریەتی›.

▣ **ضمیر اشاره**:/دستور/ جێناوی ئاماژە؛ جێناوێ کە جێگای شتێک نیشان دەدا (وەک «این»، «آن»، بە مانای «ئەمە»، «ئەوە»).

**ضمیر پرسشی**:/دستور/ جێناوی پرسینەوە؛ جێناوێ کە لەمەڕ چۆنیەتی کەسێ یان شتێکەوە دەپرسێ (وەکوو «چە؟»، «کدام؟»، بە مانای «چی؟»، «کامە؟»).

**ضمیر شخصی**:/دستور/ جێناوی کەسی؛ جێناوێ کە دەپەرژێتە سەر یەکێک لە سێ کەسی تاک یان کۆ.

**ضمیر مبهم**:/دستور/ جێناوی نادیار؛ جێناوێ کە ئاماژەی بە کەسی نادیار یان نەناسراوە (وەکوو فلانی).

**ضمیر متصل**:/دستور/ جێناوی لکاو؛ جێناوێ کە لە ئاخری وشەوە دێت و پێوە دەلکێ (وەک «پدرم» یانێ «بابم»).

**ضمیر مشترک**:/دستور/ جێناوی هاوبەش؛ جێناوی ناوکۆ؛ جێناوێ کە بە جێی هەموو تاکەکان بە کار دەڕوا و دە فارسیدا سێ وشەن «خود؛ خویش؛ خویشتن».

**ضمیر ملکی**:/دستور/ جێناوی خاوەنداریەتی؛ هێمایێ کە نیشانەی بەندیواری شتێ یان کەسێک دەگەڵ شتێ یان کەسێکی تر دەگەیێنێت ‹در عبارت «دست من»، واژەی« من» ضمیر ملکی است: لە دەستەواژەی «دەستی من»دا، «من» جێناوی خاوەنداریەتیە›.

**ضمیر منفصل**:/دستور/ جێناوی جیاواز؛ جێناوی سەربەخۆ؛ جێناوێک کە جیاواز و سەربەخۆ بە کار دەچێ (وەکوو «آن» و «او» بە مانای «ئەوە» و «ئەو»).

**ضمیر مؤنث**:/دستور/ جێناوی مێوینە؛ پیتی ئاماژە بۆ مێوینە.

**ضمیمه**[1] / zamîme ، ـها؛ ضمایم/: [عربی]/اسم. پێوەست؛ پاشکۆ؛ پاشەر؛ پاشەڕۆ؛ شتێک بە پێکهاتە و کارکردی سەربەخۆ، کە هاوڕێ دەگەڵ شتێکی تر و زۆر جار وەک تەواوکەری ئەو شتەیە ‹این مقالە ضمیمە هم دارد: ئەم وتارە پێوەستیشی هەیە›.

**ضمیمه**[2]: صفت. پێوەست؛ لکاو؛ بە شێوەی هاوڕێ یان پێوەستکراو بە شتێکیترەوە ‹آنجا را ضمیمەی قلمرو خود کرد: ئەو شوێنەی پێوەستی خاکی خۆی کرد›.

**ضنت** / zennat, zannat/: [عربی]/اسم./ادبی/ دەسڕژدێ؛ بەرچاوتەنگی؛ چاوچنۆکی؛ چاونەزێری ‹در بیان حقایق ضنت داشت: لە وتنەوەی ڕاستیدا دەسڕژدی هەبوو›.

**ضوابط** / zavābet/: [عربی] جمعِ ☜ **ضابطه**

**ضیا** / ziyā/: [عربی]/اسم./ادبی/ ڕۆشنی؛ ڕۆشنایی؛ ڕووناکی؛ ڕووناهی؛ ڕۆناهی؛ ڕووناکایی؛ ڕوونی.

**ضیافت** / ziyāfat ، ـها/: [عربی]/اسم./ادبی/ میوانی؛ مێوانی؛ مێمانی ‹ضیافت شامی بە افتخار مهمانان دادە شد: شامێک میوانی بە شانازی میوانەکان درا›.

**ضیق** / zîq/: [عربی]/اسم./ادبی/ تەنگی؛ کەمی؛ کورتی.

▣ **ضیق معاش**: تەنگی ژیان؛ دەستتەنگی؛ سەختی ژیان.

**ضیق وقت**: کەمی کات؛ کەمیوەخت؛ کورتی مەودا.

# ط

t/: *حرف.* نیشانەی نۆزدەهەمین پیتی
وبێتکەی فارسی؛ ئەم نیشانەیە عەرەبیە و
نە ڕەگەز عەرەبیەکانی زمانی فارسیدا بە
ەڕوا و وەک «ت» ئەخوێنرێتەوە.
tā/:[عربی]/*اسم.* تا؛ تێی دەستەدار؛ ناوی
هەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی:
**مۆلف؛ طین**
**ای مؤلّف** ☜ **طا**
**ق النعل بالنعل** / tābeqonna'lebenna'l/:
] *صفت.* دەقاودەق؛ جووت یەک؛ جفت یەک؛
تومت یەک؛ کوت یەک؛ عەین یەک؛
ومەین یۆ؛ هەر وەکوو یەک (وەکوو دوو
ی گۆڤارێک) ‹جملەهای هر دو کتاب طابق‌النعل
ل یکی بود: ڕستەگەلی هەر دوو کتێبەکە
دەقی یەکتر بوون›.
**ارم** / tārem, tāram/:/*اسم.* ١. خێوەت؛
مال ٢. ☜ **تارمی**
**می** / tāremî, tāramî/ ☜ **تارمی**
**ی** / tās/ ☜ **تاس**
**ک** / tāsak ، ـها/: [معرب/ فارسی]/*اسم.*
وولکە؛ جامۆلکە؛ جامۆڵە؛ تاسیلە؛ تاسوولکە؛
ەی لەمس.
**طاسک آبخوری**: ترگار؛ ترار؛ بادی؛
خوەری؛ ئاوخواردنەوە.

**طاس کباب** / tāskabāb/: [معرب/ فارسی] ☜ **تاس کباب**

**طاسی** / tāsî/ ☜ **تاسی**

**طاعات** / tā'āt/: [عربی] جمعِ ☜ **طاعت**

**طاعت** / tā'at ، ـها؛ طاعات/: [عربی]/*اسم.* */ادبی/* فەرمانبەری؛ تاعەت ‹طاعت از دست نیاید گنهی باید کرد: فەرمانبەری دەس نادا چش لە سووچێک›.

**طاعون** / tā'ûn/: [عربی]/*اسم.* تاعوون؛ بامرنێ؛ چاوەقوولە؛ چاوقوولکە؛ لاڕەشە؛ قڕان؛ نەخۆشینێکی گیرۆی مەترسیدارە هاورێ دەگەڵ یاو، پیسی خوێن، خوێنڕێژی بەربلاو لە ژێر پێست و شانەگەلی ژێرپێستی و جەرگ و دڵ.

▣ **طاعون گاوی**: قۆڕە؛ تاعوونی ڕەشەولاخ؛ گاقڕان؛ نەخۆشیەکی ویرووسی و چڵکی ئاژەڵە، بەتایبەت گا تووش دەبێ.

**طاعون مرغ**: سیپۆ؛ پۆپەڕەشە؛ مریکانە؛ دەردەمریشک.

**طاغوت** / tāqût ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ١. سەربزێو؛ کەسێ کە لە فەرمانی خودا سەرپێچی کردووە و بەرهەڵستی بووە ٢. */مجازی/* شای سەربزێو؛ شا یان حاکمی بێدین و باوەڕ.

**طاغوتی** / tāqûtî ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* ١. سەربزێوانە ٢. */مجازی/* تاغووتی؛ شادۆست

۳. *[مجازی]* شایانه؛ بە دەبدەبە و کەبکەبە ‹زندگی طاغوتی: ژیانی شایانە›.

**طاغی** / tâqî ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت. [نامتداول]* یاخی؛ سەرکێش؛ کەڵەگا.

**طاق** / tâq/: [معرب از فارسی] ☜ **تاق**

**طاقباز** / tâqbâz/: [معرب/ فارسی] ☜ **تاقباز**

**طاقت** / tâqat/: [عربی]/*اسم.* ۱. تابشت؛ تاو؛ توان؛ تەشە؛ زۆخ؛ توانایی بەرگەگرتن لە بەر تەوژم و سەخڵەتیەوە ‹شتر جانور پرطاقتی است: وشتر گیانداریکی بە تابشتە› ۲. تاقەت؛ بەرگە؛ وەرگە؛ وەرەقەت ‹کمی طاقت داشته باش!: هێندێ تاقەتت هەبێ!›.

▣ **طاقت آوردن:** تاقەت هێنان؛ تاو هاوردن؛ تاقەت گرتن؛ ددان بە خۆدا گرتن/ نیان ‹کمی طاقت بیار، الآن دکتر می‌آید: کەمێ تاقەت بێنە، ئێستا دوکتور دێت›.

**طاقت داشتن:** بە تاقەت بوون؛ خۆگرتن؛ تابشت هەبوون؛ بەرگەگرتن؛ وەرگەگێرتەی ‹من طاقت دیدن این منظره را ندارم: من تاقەتی دیتنی ئەم دیمەنەم نیە›.

**طاقت کسی طاق شدن:** *[مجازی]* ورە بەردان؛ بێ‌تاقەت بوون؛ وەڕەز بوون؛ تاقەت لە لا نەمان؛ تاقەت لە کەسێ بڕیان؛ چیتر بەرگە نەگردن ‹دیگر طاقتم طاق شد و فریاد زدم: ئیتر ورەم بەردا و هاوارم کرد›.

**طاقت‌فرسا** / tâqatfarsâ/: [عربی/ فارسی] *صفت.* پرووکێنەر؛ زۆر سەخت و ئازاردەر؛ هۆی لە نێو چوونی توانایی بەرگەگردن و خۆ ڕاگرتن.

**طاقچه** / tâqče/: [معرب/ فارسی] ☜ **تاقچه**

**طاقدیس** / tâqdîs/: [معرب/ فارسی] *[زمین‌شناسی]* تاق‌تاقە؛ ڕەوەز؛ چینێ لە بەرد لە کێودا کە وەک تاقی لێ هاتووە.

**طاقگان** / tâqgân/: [معرب/ فارسی] ☜ **تاقگان**

**طاقنما** / tâqnemâ/: [معرب/ فارسی] ☜ **تاقنما**

**طاقه** / tâqe ، ـها/: *اسم.* تاقە؛ یەکەی بەستەبەندی پارچە لە کارخانەدا بە شێوەی چوارگۆشەی درێژ (بە پێچەوانەی تۆپ کە بە شکڵی گرۆڤەرە).

**طاقه‌فروشی** / tâqefurûšî ، ـها/: *اسم.* تاقەفرۆشی؛ تاقەورەشی؛ سەرجەم فرۆشی پارچە بە شێوەی تاقە. هەروەها: **طاقه‌فروش**

**طاقیه** / tâqiye ، ـها/: [معرب از کردی]/*اسم.* تاقیلە؛ تەقیلە؛ تاقیلێ؛ ئارەقچن؛ جۆرێ کڵاوی دەسچنە.

**طالار** / tâlâr/ ☜ **تالار**

**طالب** / tâleb ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.* خوازیار؛ داواکار؛ خوازگار؛ خوازەر؛ خواستەر؛ داوخواز ‹طالب علم: خوازیاری زانست›.

▣ **طالب بودن:** خوازیار بوون؛ داواکار بوون. هەروەها: **طالب شدن**

**طالبی** / tâlebî ، ـها/: [عربی]/*اسم.* تالبی؛ تاڵبی؛ گرکە؛ تاڵکە؛ گەرمک؛ گەرمەک: ۱. گیایێ ئالیکی لە تیرەی خەیار ۲. بەری ئەو گیایە کە لە کاڵەک ئەکا، بەلام خڕ و بچووکترە، بە پێستێکی سەبز و زەرد و زرو و گۆشتی زەرد یان سەوزی ئاودارەوە کە شیرین و خۆراکیە.

**طالع**[1] / tâle'/: [عربی]/*اسم.* چارەنووس؛ ناوچاو؛ بەخت؛ نگین؛ بەختە؛ هات؛ کابەشاک؛ تاڵە ‹طالع خوبی نداشت: چارەنووسێکی باشی نەبوو›.

**طالع**[2]: *صفت. [ادبی]* سەرهەڵدەر ‹خورشید طالع: خۆری سەرهەڵدەر›.

**طالع‌بین** / tâle'bîn ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ئەستێرەگەڕ؛ بەختزان؛ کەسێ کە لە ئەستێران دەڕوانێ و چارەنووسی خەڵکی تێدا دەبینێ. هەروەها: **طالع‌بینی**

**طاوس** / tâvûs/: ☜ [معرب از آرامی] **تاووس**

**طاووس** / tâvûs/: [معرب از آرامی] ☜ **تاووس**

**طاهر** / tâher ، ـین/: [عربی] *صفت. [ادبی]* پاک؛

پاقژ؛ پاکژ؛ پاکش؛ خاوێن؛ پوخته؛ بژون.

**طایر** / tāyer/: [عربی]/اسم. ١. *[نجوم]* ☜ **قوا**
٢. *[ادبی، نامتداول]* پەلەوەر؛ باڵندە؛ باڵنە؛ باڵدار؛ مەل؛ سر؛ فڕندە؛ پەڕندە؛ فڕنە؛ فڕا؛ باڵ گرەوە
٣. ☜ **تایر**

**طایر** / tāyer/: [انگلیسی] ☜ **تایر**

**طایفه** / tāyefe ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. *[قدیمی]* بەرەباب؛ تیرە؛ خانەوادە؛ قەوم و قیله ‹از طایفه‌ی ما نیست: لە بەرەبابی ئێمە نیە› ٢. /طوایف/ تایفە؛ پەل؛ بەشێک لە خێڵ یان هۆز کە لە یەک شوێن و لەوەڕگە نیشتەجێ دەبن
٣. *[زیست‌شناسی]* تایفە؛ تاقمی سروشتی گیانداران بە پێناسەگەلی هاوبەشی و پێوەندی نزیکەوە (وەک تایفەی مێش).

**طب** / teb(b)/: [عربی]/اسم. بژیشکی؛ پزشکی.

▣ **طبّ بالینی:** ئەو بەشە لە زانست و پیشەی بژیشکی کە بریتیە لە چاو پێکەوتن و دەرمانی نەخۆش.

**طبّ پیشگیری:** ئەو بەشە لە زانست و چالاکیگەلی بژیشکی کە دەپەرژێتە سەر بەرگری لە پەیدا بوونی نەخۆشیگەل.

**طبّ سوزنی:** جۆرێک دەرمانی نەخۆشیگەل بە دەرزی چەقاندن لە خاڵگەلێکی دیاریکراو لە لەشی نەخۆشدا.

**طبابت** / tebābat, tabābat ، ـها/: [عربی]/اسم. بژیشکی؛ پزیشکی؛ کار و ڕەوتی دەرمان کردنی نەخۆشیگەل.

▣ **طبابت کردن:** بژیشکی کردن؛ دەرمان کردن؛ دەرمان کردنی نەخۆشان ‹خودت برای خودت طبابت نکن!: بە خۆتەوە بژیشکی مەکە!›.

**طباخ** / tabbāx ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* چێشتچێ کر؛ چێشتلێنەر؛ شێوکەر؛ ئاشپەز.

**طباخی** / tabbāxî/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* ١. ـها/ چێشتچێ کری؛ چێشتلێنەری؛ ئاشپەزی؛ شێوپەزی ٢. دووکانێک کە چێشتی لێنراوی تێدا دەفرۆشن ٣. ـها/ سەروپێ؛ کەلەپاچەیی؛ شوێنی سەرەوپا فرۆشتن.

**طباشیر** / tabāšîr/: [معرب از فارسی] ☜ **تَباشیر**

**طبال** / tabbāl ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. تەپڵژەن؛ دەهۆڵلێدەر؛ دەوڵژەن؛ تەپڵ کوت؛ دەوڵ کوت.

**طبایع** / tabāye'/: [عربی] جمعِ ☜ **طبیعت**

**طبخ** / tabx/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ١. کار و ڕەوتی کوڵان؛ کوڵیان؛ کەلان ‹طبخ غذا: کوڵانی چێشت› ٢. ئاشپەزی؛ لێنانی چێشت. هەروەها:
**طبخ کردن**

**طبری** / tabarî/ ☜ **تبری**

**طبع** / tab'/: [عربی]/اسم. ١. /ـها/ سرشت؛ سروشت؛ تەبیات ٢. توانایی؛ لێهاتوویی؛ زۆخ ‹پدرم طبع شعر خوبی داشت: بابم توانایی شیعری باشی هەبوو› ٣. *[قدیمی]* چاپ.

**طبع‌آزمایی** / tab'āz(e)māyî ، ـها/: [عربی/فارسی]/اسم. کار و ڕەوتی تاقیکردنەوەی تواناییگەلی زەوقی و هونەری خۆ.

**طبعاً** / tab'an/: [عربی]/قید. دیارە؛ وەک دیارە ‹طبعاً تا آن روز برمی‌گردد: دیارە تا ئەو ڕۆژە دەگەڕێتەوە› ٢. بە پێی سروشت ‹طبعاً می‌افتد پایین: سروشتیە کە دەکەوێتە خوارەوە›.

**طبق** / tabaq ، ـها/: [معرب از فارسی]/اسم. تەبەک؛ تەوەق؛ تەبەق؛ تەباخ؛ شکەڤ؛ شکەڤگ؛ شکەڤک؛ شەکەویک؛ شکۆک؛ ئەشکەفک؛ شکەفک؛ ئەشکەو؛ مزاخە؛ سووهین؛ بەرگەش؛ بەرکەش؛ سینی؛ خوان؛ خوانچە؛ تەخنک؛ خارووفک؛ لەنگەری؛ یالتەبەق؛ دەفری چێوینی تەخت و لێوارە کورت کە پیتەوای تێ دەچنن و لە سەر سەرەوە دەیبەن.

▣ **طبق زدن:** ١. تەقاندنەوە؛ تەقانن؛ تەقنەی؛ تەقنای؛ تەتەڵەکەردەی؛ تەتەڵەکردن؛ تەترەکردن؛ تەوەق کردن؛ لەنگەری کەردەی؛ هەڵتەکاندنی تەبەک بۆ هەڵاوردنی بەرد و

قەسەڵ لە دەغڵ ٢. *[مجازی]* پان‌پانۆکە کردن؛ پان‌پانۆکێ کردن؛ خۆ بە یەکتر ڕەحەت‌کردنی ژنان: **مُساحِقه**

**در طبق اخلاص نهادن** ☜ **در**[٢]

**طبق** / tebqe/: [عربی] *حرف.* بەپێ؛ پاو؛ بەرانبەر بە؛ هەمبەر بە ‹طبق قانون: بەپێی قانون›.

▣ **بر طبق:** بەرانبەر بە؛ بەرابەر بە؛ بە پێ؛ پاو ‹بر طبق دستور مافوق عمل کنید: بەرانبەر بە فەرمانی بالادەست کار بکەن›.

**طبقات** / tabaqāt/: [عربی] جمعِ ☜ **طبقه**

**طبقاتی** / tabaqātî/: [عربی] *صفت.* چینایەتی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە چینەوە ‹اختلاف طبقاتی: جیاوازی چینایەتی› ٢. نهۆمی؛ قاتی؛ خاوەنی چین و نهۆم ‹پارکینگ طبقاتی: پارکینگی نهۆمی›.

**طبقدار** / tabaqdār، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] *اسم.* تەوەقدار؛ دەسفرۆش؛ کەسێ کە لە سەر تەوەق پیتەوا دەفرۆشێ.

**طبق‌کش** / tabaqkeš، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] *اسم.* خوانچەبەر؛ تەوەق‌کێش؛ کەسێ کە خوانچە دەبا.

**طبقه** / tabaqe، ـها؛ طبقات/: [عربی] *اسم.* ١. قات؛ نهۆم؛ نوهۆم؛ نهام؛ نهوم؛ تەبەقە؛ ماخ؛ مەزەڵ؛ مەرتەبە؛ بۆشایی نێوان دوو میچ لە خانووبەرەیەکدا ‹ساختمان پنج طبقه: خانووی پێنج قاتی› ٢. چین؛ تاقمێکی گەورە لە خەڵک کە خاوەن دۆخ و قازانجگەلێکی ئابووری و ڕامیاری یەکسانن ‹طبقەی کارگر: چینی کرێکار› ٣. تەبەقە؛ نهۆم؛ قات؛ هەر یەکە لە ڕووپەڕگەلی قەفەسە و کەشاو و... ٤. *[زمین‌شناسی]* لۆ؛ تویژ؛ توێک؛ لە دابەشکراوەگەلی چکۆلەی خولی زەوین‌ناسی.

▣ **طبقه‌ی آخر:** نهۆمی ئاخر؛ قاتی ئاخر؛ تەبەقەی ئاخر؛ بالاخانە؛ بان‌ترین قات لە خانووبەرەیەکدا.

**طبقه‌ی اوّل:** نهۆمی ئەوەڵ؛ قاتی یەکەم؛ تەبەقەی هەوەڵ: ١. نهۆمی هاوکەف ٢. نهۆمێ کە لە بان نهۆمی هاوکەفدایە.

**طبقه‌ی همکف:** نهۆمی ئەوەڵ؛ قاتی یەکەم؛ هەوەڵین نهۆمی خانووبەرە (هاوڕێکی کۆڵان یان شەقام).

**طبقه‌بندی** / tabaqebandî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* دەستەبەندی؛ پۆل‌بەندی؛ دەستەبژێری؛ پۆلێن؛ کار و ڕەوتی دابەش‌کردن یان تەکووزکردن بە پێ بابەت، جنس، چۆنیەتی و... ‹طبقه‌بندی مشاغل: دەستەبەندی پیشەگەل›.

**طبل** / tabl، ـها/: [عربی] *اسم.* دەوڵ؛ دەهۆڵ؛ دهۆڵ؛ دێوڵ؛ تولوم؛ سازێکی گەورەی گرۆڤەرە کە پێستێکی ناسکیان بە هەر دوو سەریدا کێشاوە و بە دوو چێو دەیژەنن.

▣ **طبل توخالی/ میان تهی:** *[کنایی]* دەهۆڵی هەرۆڵ؛ تەپڵی بەتاڵ؛ هۆگاڵەی فێڕۆ و بێ‌کاریگەری ‹تهدیدهای او طبل توخالی است، نترس!: هەڕەشەکانی تەپڵی بەتاڵە، مەترسە!›.

**طبله** / table، ـها/: [عربی] *اسم.* تەپڵەک؛ پەنەماوی توێکی دیوار (گەچ، سیمان) بە هۆی شێ یان دارزاوییەوە ‹گچهای دیوار طبله کرده بود و می‌ریخت: گەچی دیوارەکە تەپڵەکی بوو، دەرژا›.

**طبی** / tebbî/: [عربی] *صفت.* بژیشکی؛ پزشکی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە بژیشکیەوە ‹مراقبتهای پزشکی: چاوەدێری بژیشکی› ٢. خاوەن کارامەیی لە بژیشکیدا ‹اسباب طبّی: کەرەستەی بژیشکی› ٣. هاوڕێ دەگەڵ بنەماگەلی بژیشکیدا ‹تشک طبی؛ کفش طبی: دۆشەکی بژیشکی؛ پێڵاوی بژیشکی›.

**طبیب** / tabîb، ـها؛ ـان؛ اطبّا/: [عربی] *اسم.* *[قدیمی]* بژیشک؛ پزشک؛ حەکیم.

**طبیعت** / tabî'at/: [عربی] *اسم.* سروشت؛ سوروشت؛ سرشت؛ خۆکرد؛ خۆرست؛ خۆڕسک؛

خۆزا؛ تەبیات: ١. ئەو بەشە لە جیهان کە درووسکراوی دەستی مرۆ نیه (وەک کێو، دەشت، چۆم، لێرەوار و...) ‹روزی را در آغوش طبیعت گذراندیم: ڕۆژێکمان لە داوێنی سروشتدا ڕابوارد› ٢. هێزی بەدیهێنەر و هەڵوەژێری جیهان ‹قانون طبیعت: قانوونی سروشت› ٣. /ـها؛ طبایع/ گەد و خۆ و خدە ‹طبیعت سازگار: سروشتی سازگار› ٤. تایبەتمەندی پێکهاتەی شتێک ‹طبیعت آتش سوزاندن است: سروشتی ئاگر سووتاندنه›.

▣ **طبیعت بی‌جان:** سروشتی بێ‌گیان؛ وێنەی شتی بێ‌گیان (وەکوو بایە، گۆزە، گوڵدان، پارچە، مێز و ...)

**طبیعت‌گرایی** / tabî'atgerāyî/: [عربی/ فارسی] /اسم. سروشت‌خوازی؛ ناتورالیسم؛ سروشتەوگری: ١. کردەوە، هۆگرەتی یان ئەندێشەیەک کە تەنیا لە سەر بناغەی ویستگەل و پێداویستگەلی سروشتیە ٢. ئامۆژەیەکی فەلسەفی کە بۆ دیاردەگەل گرنگایەتیەکی زۆور سروشتی دانانێ و بۆ شرۆڤەیان قانوون و کاردانەوەگەلی سروشتی پێ بەسە ٣. ڕێبازێک لە هونەر و وێژەدا، بە پێی ڕوانینی زانستی لە ڕووداوگەلی ژیان، بێ‌هەوڵدان بۆ نیشاندانی نموونەگەلی ئارمانی و خەیاڵی یان بە پارێز لە وتنەوەی ناحەزیەکان * **ناتورالیسم**. هەروەها: **طبیعت‌گرا؛ طبیعت‌گرایانه**

**طبیعی**¹ / tabî'î/: [عربی]/اسم. سروشتی؛ زانستی سروشتی.

**طبیعی**²: *صفت.* سروشتی؛ سوروشتی؛ سرشتی؛ خۆکرد؛ خواکرد؛ خۆڕسک؛ خۆوەر؛ خۆڕست؛ خۆڕسکاو: ١. پێوەندیدار بە تەبیاتەوە. بەرانبەر: **عارضی** ‹علوم طبیعی: زانستە سروشتیەکان› ٢. درووسکراوی سروشت. بەرانبەر: **مصنوعی** ‹پدیدەهای طبیعی: دیاردە سروشتیەکان› ٣. پێوەندیدار بە خۆ و خدە یان غەریزەوە ‹رفتار طبیعی؛ صدای طبیعی: ئاکاری سروشتی؛ دەنگی سروشتی›.

**طبیعیات** / tabî' îyyāt/: [عربی]/اسم. /قدیمی/ سروشتیگەل؛ سروشتیان؛ زانستگەلی سروشتی.

**طبیعیدان** / tabî'îdān، ـها/: [عربی]/اسم. ١. سروشتزان؛ کەسێ کە لە دیاردەگەلی سروشت لێکۆڵینەوەی هەیە ٢. ژیوارناس؛ ژیانناس؛ ژینناس.

**طپانچه** / tapānqče/ ☜ **تپانچه**

**طپاندن** / tapāndan/ ☜ **چپاندن**

**طپش** / tapeš/ ☜ **تپش**

**طپیدن** / tapîdan/ ☜ **تپیدن**

**طحال** / tahāl/: [عربی]/اسم. سپڵ؛ سەپەڵ؛ ئەسپووڵ؛ ئسپل؛ ئسپیل؛ سوویە؛ فشک؛ دێدک؛ دێدەڕەش؛ پەشاڕەش؛ خوش‌خوشک؛ گورگنەخۆرە؛ خالخالک؛ فاتەڕەشک؛ ددان‌خۆشک؛ تاڵ؛ ئەندامێکی لووئاسا لە سەرووی لای چەپی گەدەوە کە کاری لە نێو بردنی خڕۆکە سوورە پیرەکانی خوێن و دروست کردنی خڕۆکەی تازەیە.

**طحن** / tahn/: [عربی]/اسم. /قدیمی/ ١. خنگار؛ کاری هاڕین؛ هێڕین؛ هەڕین؛ هیرتن؛ هاڕەی؛ گەژمراندن؛ وردکردن و کردنە ئاردی گەنم و... ٢. /مجازی/ کاری جوون؛ جاوین؛ جاکاندن؛ ژاوەی.

**طراح** / terrāh، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. داڕێژەر؛ گەڵاڵەکار؛ گەڵاڵەداڕێژ؛ پلان‌داڕێژ؛ پێکهێنەری گەڵاڵە ‹طراح اطلاعات کافی دربارەی جزئیات طرح ارائه نکرده است: داڕێژەرەکە شارەزایی باشی لەمەڕ وردەکاریەکانی گەڵاڵەکەوە ئاراستە نەکردووە›.

**طراحی** / tarrāhî، ـها/: [عربی]/اسم. گەڵاڵەداڕێژی: ١. کار و ڕەوتی گەڵاڵە داڕشتن؛ دابین‌کردن یان پێک‌هێنانی گەڵاڵە ٢. کاری کێشانی نەخشەی سەرەتایی و گشتی دەگەڵ دیاری‌کردنی ئەندازەگەلی پاژ و توخمگەلی

پێکهاته، دەزگا، ئامێر، ڕەوت یان بەرهەمێکی هونەری بۆ کاری دواتر. هەروەها: **طراحی شدن؛ طراحی کردن**

**طرار** / tarrār ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. /ادبی/ تەڕدەست؛ کیسەبڕ؛ قەمکە؛ قەمک؛ دزی زەبەردەست و خێرا.

**طراوت** / tarāvat/: [عربی]/اسم. /ادبی/ ١. تەڕچکی؛ پەژی؛ پاراوی؛ تەڕ و بەڕی؛ تورتی ٢. گەشی؛ سەرزیندوویی.

**طرب** / tarab/: [عربی]/اسم. /ادبی/ شادی؛ شایی؛ کەیفخۆشی؛ خۆشی؛ وەشی؛ خۆشحاڵی.

**طرب‌انگیز** / tarabangîz/: [عربی/ فارسی] صفت. /ادبی/ شادیهێنەر؛ خۆشیهێنەر؛ شادیبەخش.

**طرح** / tarh ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. گەلاڵە؛ نەخشە؛ تەرح؛ نووسراوە یان پێشنیارێک بۆ گەیشتن بە ئامانج یان ئامانجگەلێکی دیاریکراو ‹طرح ایجاد اشتغال: گەلاڵەی پێکهێنانی کار› ٢. پلان؛ پیلان؛ گەلاڵە؛ تەرح؛ شکڵ؛ وێنەی سەرەتایی کە بیچمی گشتی شتێک نیشان دەدا ‹طرح نمای ساختمان: پلانی ڕووبەری ساختومان› ٣. گەلاڵە؛ تەرح؛ ڕێوشوێن؛ ڕیچ؛ دەستووری کار؛ وێنە یان نووسراوەیەک بۆ دروستکردنی شتێ یان جێبەجیکردنی کارێک ٤. تەرح؛ قانوونێ کە لە لایەن نوێنەرانەوە بە پارلەمان پێشنیارکراوە ٥. تەرح؛ بەرنامەیەک بۆ جێبەجێ بوونی کارگەلێک لە داهاتوودا ٦. بیچم؛کەسم؛ سەکوت؛ مەوژ؛ تەحر ٧. کار یا ڕەوتی هێنانە بەرەوە و خستنە بەر باس.

◘ **طرح دادن:** گەلاڵە دان؛ پلان دان؛ پێشنیارکردنی تەرح ‹طرحی برای افزایش محصول گندم بە دولت دادە شدە است: پلانێک بۆ زۆرکردنەوەی داهاتی گەنم بە دەوڵەت دراوە›.

**طرح ریختن:** گەلاڵە دارشتن؛ پلان دارژتن؛ پێکهێنانی تەرح ‹در طرح ریختن استادند، امّا اجرایش نمی‌کنند!: لە گەلاڵە دارشتن وەستان، بەلام بەڕێوەی نابەن!›.

**طرح کردن:** هێنانە ئاراوە؛ پێشنیارکردن؛ هێنانە پێش؛ هاوردنە بەرەوە.

**طرح کشدن:** تەرحکێشان ‹از صورت مادرم طرحی کشید: لە روخساری دایکم تەرحێکی کێشا›.

**طرحواره** / tarhvāre ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. گەلاڵە؛ گلاڵە؛ پلان: ١. وێنەیەکی خەتی ساکار ٢. گەلاڵەیەکی گشتی سەرەتایی و بێوەری لە وردەکاریگەل.

**طرد** / tard/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی دوور خستنەوە؛ دوورەوە وسەی؛ تاراندن؛ ڕاواندن؛ ڕەواندن.

◘ **طرد شدن:** ١. وەلا نران؛ خرانە لاوە ٢. دەرکران؛ دەرکریان؛ ڕاونران؛ تارێنران ‹از آن پس از خانوادەاش طرد شد: لەوە بە دواوە لە بنەماڵەکەی دەرکرا›.

**طرد کردن:** دەرکردن؛ تاراندن؛ ڕەواندن؛ ڕەڤاندن ‹دوستانش او را طرد کردند: هەوالەکانی ئەویان دەرکرد›.

**طرز** / tarz/: [عربی]/اسم. شێواز؛ شێوە؛ ڕەنگ؛ بار؛ جۆر؛ تەرز؛ چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کارێک.

◘ **طرز تفکر:** شێوازی بیرکردنەوە؛ چۆنیەتی بیر و بۆچوون.

**طرف**[1] / taraf/: [عربی]/اسم. لا؛ لایین؛ لایەن؛ ئالی؛ بال؛ هاوێر؛ دەورە؛ نکال؛ نک؛ تەرف؛ تەرەف؛ کشتە؛ تۆل؛ هند؛ قورنە؛ ڕەخ؛ بەر؛ جەبەر؛ گاز: ١. /ـها؛ اطراف/ سوو؛ بەرەوگە؛ ڕاسای خالی ئامازە پێکراو ‹آن طرف: ئەو لا› ٢. هەر یەک لە لایەنەکان یان شێوازگەلی بەرانبەری یەکتر ‹طرف عصر؛ طرف معامله: لای عەسر؛ لایەنی سەودا›.

◘ **از طرف کسی/ جایی:** لە لایەن کەسێک/

شوێنێکەوە؛ بە نوێنەری یان بە جێگری ئەو شتە یان ئەو کەسە ‹نامە را از طرف وزیر امضا کرده بود: نامەکەی لە لایەن وەزیرەوە واژۆکردبوو›

▣ **طرف بودن:** ناسین؛ لە کارێکدا (سەودا، شەڕ و...) لە بەرانبەری کەسێک یان کەسانێکدا ڕاوەستان ‹در این معامله تو با من طرف هستی: لەم مامڵەدا تۆ من دەناسی›. هەروەها: **طرف شدن؛ طرف کردن**

**طرف کسی را گرفتن:** لایەنی کەسێک گرتن؛ لایەنگری لە کەسێک کردن؛ پشت کەسێک گرتن ‹مردم طرف ما را گرفتند: خەڵکی لایەنی ئێمەیان گرت›.

**طرف**[2]: ضمیر. ئەو؛ وی؛ یارۆ؛ کابرا؛ ئاد (بۆ نێر)؛ ئادە (بۆ مێ)؛ کەسێ کە نەیانەوێ ناوی بەرن ‹به طرف گفتم؛ دیروز طرف آمده بود: بە ئەوم گوت؛ دوێنێ کابرا هاتبوو›.

**طرف** / tarafe/: [عربی] صفت. لای؛ لاو؛ بەری؛ ڕووی؛ لە بەر؛ وەروو ‹طرف توجه: لای سەرنج›.

▣ **طرف اعتماد:** جێباوەڕ؛ جێمتمانە؛ جێبڕوا؛ ئەو کەسەی متمانەیان پێ هەیە ‹او طرف اعتماد همه است: جێباوەڕی هەموانە›.

**طرف توجه:** بەرچاو؛ سەرنجڕاکێش؛ ئەو کەسەی سەرنجی پێدەدەن ‹در هر شهری شهردار خیلی طرف توجه است: لە هەموو شارێکدا، شارەدار یەکجار بەرچاوە›.

**طرف حساب:** ۱. ئەو کەسەی کە پارەی لای کەسێکە یا پارەی کەسێکی لایە ۲. ☜ **طرف معامله**

**طرف قرارداد:** لایەنی بڕیار؛ هەر یەک لەوانەی کە لە مامڵە یان پێکهاتنێکدا، واژۆ دەدەن و بە پێی ئەوە کارێک وە ئەستۆ دەگرن.

**طرف مذاکره:** لایەنی وتووێژ؛ هەر یەکە لەوانەی کە لە وتووێژێکدا دەگەڵ کەس یان کەسانێک ڕووبەڕوو دەبنەوە.

**طرف معامله:** لایەنی مامەڵە؛ لایەنی دانوسان؛ لایەنی سەودا؛ ئەوەی کە دەگەڵ کەسێکیتردا مامەڵە دەکات: **طرف حساب ـ ۲**

**طرف** / tarf/: [عربی]/اسم/ [ادبی] پاڵداوێن؛ لاکۆش؛ گۆشەی دامێن.

▣ **طرفی بربستن:** [مجازی] بەرهەمێک وەرگرتن؛ شتێ هەڵکڕاندن ‹شاید بتواند از تلاشهایش طرفی بربندد: ڕەنگە بتوانێ لە کرد و کۆشی بەرهەمێک وەربگری›.

**طرفدار** / tarafdār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. لادار؛ لاگیر؛ لانگر؛ لایەنگیر؛ بەسە؛ بەستە؛ هەوادار؛ هواخوا؛ داژدار؛ پاڵوبەن؛ پشتیوان.

**طرفداری** / tarafdārî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم/ لاکۆشکە؛ لاگری؛ لاداری؛ لاگیری؛ لانگیری؛ لایەنگری؛ لایەنگیری؛ داکۆکی؛ پشتیوانی؛ داشداری؛ داژداری.

**ـ طرفه** / tarafe/: [عربی] پیواژه. ـ لایەنە؛ ـ لایەن: ۱. خاوەن بەرەوگەی دیاریکراو ‹خیابان یکطرفه: شەقامی یەکلایەنە› ۲. خاوەن لایەنگەلێکی دیاریکراو ‹تعهد دوطرفه: بڕیاری دوولایەن› ✻ **طرفی** [گفتاری]

**طرفه** / torfe ، ـها/: [عربی]/اسم/ [ادبی] ۱. هەڵکەوتە؛ شتی نوێ کە پێشتر نەبینراوە ۲. سەرسووڕێن؛ سەرسووڕێنەر؛ هەژەند؛ شتێکی زۆر سەیر و سەمەرە.

**طرفةالعین** / torfatol'eyn/: [عربی]/اسم/ چاوترووکان؛ چاولێکنان؛ ترووکە؛ چاوترووکە؛ چاڤمچان؛ کاتێ بە ماوەی چاوترووکاندنێک.

**ـ طرفی** / tarafî/: [عربی] پیواژه. [گفتاری] ـلا؛ ـلایی ‹کاش کار یکطرفی می‌شد: بریا کارەکە یەکلا دەبۆوە›.

**طرفیت** / tarafîyyat/: [عربی]/اسم/ دوژمنی؛ دژمنایەتی؛ نەیاری؛ هەڵا؛ گێرە و کێشە؛ کێشە

و بەرە.

**طرفین** / tarafeyn/: [عربی]/*اسم.* دوو لایەن؛ دوو لا؛ هەر دوو لا.

**طرق** / toroq/: [عربی] جمعِ ☜ **طریق**

**طرقه** / torqe/: [عربی]/*اسم.* بۆقژە؛ بازۆر؛ بازۆڕی؛ بازڕ؛ باڵندەیێکی گچکەی شینە بە دەنگێکی خۆشەوە لە ڕیشۆڵە دەکا.

**طرلان** / tarlān/: [ترکی] ☜ **شهباز**

**طره** / torre ، ـها/: [عربی]/*اسم.[ادبی]* ١. ئەگریجە؛ پەرچەم؛ گولانگ؛ ئەو مووەی کە لە پەنای گوێ و تەوێڵەوە شۆڕ دەبێتەوە ٢. *[معماری]* سەرتاق؛ هەڵهاتوویی سرمیچ لە بان دیوار، درگا یان دەلاقەوە.

**طریق** / tarîq ، ـها؛ طُرُق/: [عربی]/*اسم.[ادبی]* ١. ڕێگا؛ ڕێ؛ ڕا ‹از طریق هوا؛ از طریق دریا: لە ڕێگای هەواوە؛ لە ڕێی دەریاوە› ٢. شێوە؛ ڕەوشت ‹به طریق دوستانه: بە شیوەی دۆسانە›.

**طریقت** / tarîqat ، ـها/: [عربی]/*اسم.[ادبی]* ١. بۆچوون؛ دۆز؛ ڕێباز؛ مەرام ٢. تەریقەت؛ هەر کام لە ڕێبازگەلی سۆفیگەری.

**طریقه** / tarîqe ، ـها/: [عربی]/*اسم.* شێوە؛ شێواز؛ ڕەوش؛ ڕەوشت ‹طریقەی رانندگی؛ طریقەی دوستی: شیوەی ڕانندەیی؛ شێوازی دۆستی›.

**طشت** / tašt/: [معرب از فارسی] ☜ **تشت**

**طشتک** / taštak/: [معرب/ فارسی] ☜ **تشتک**

**طعام** / ta'ām ، ـها؛ اطعمه/: [عربی]/*اسم.[ادبی]* نان؛ خواردەمەنی؛ خۆراک؛ خواردن؛ خواردنی؛ پێخۆر.

**طعم** / ta'm ، ـها/: [عربی]/*اسم.* چێژ؛ چەژ؛ چەشک؛ چەش؛ تام؛ مەزە؛ تایبەتیەکی دیار لە هێندێ ماک کە بە هۆی ئەندامی چێژەوە هەستی پێدەکرێ ‹این خمیردندان طعم دارچین میدهد: ئەم خەمیرددانە چێژی دارچین دەدا›.

**طعم‌آرزو** / ta'mārzû, ta'm'ār(e)zû/: [عربی/ فارسی] *صفت.* تامەزرۆ؛ تامازرۆ؛ بە ئاواتی شتێ کە دەستی نەکەوتووە یان کەمتر بۆی دەستی داوە.

**طعمه** / to'me ، ـها/: [عربی]/*اسم.* چێشتە؛ چێژە؛ چەشە؛ چەشکە؛ باڵتە: ١. خۆراکی گیاندارێک، بەتایبەت گیانداری ڕاوکەر ‹طعمەی شیر: چیشتەی شێر› ٢. تملۆک؛ تامک؛ چەشتە؛ چەشک؛ ماکێکی خۆراکی یان شتێک وەکوو ئەوە کە لە ڕاو یان ماسی‌گرتندا بۆ ڕاکێشانی نێچیرەکە بە کار دەڕوات ‹حالا به جای کرم و مگس طعمەی مصنوعی به بازار آمده است: ئێستا بە جێی کرم و مێش چیشتەی دەسکرد هاتووەتە بازاڕ›.

⊡ **طعمه چیزی شدن:** کەوتنە بەر شتێکەوە؛ کەوتنە بەر زەرەر و لە نێو چوونەوە ‹خانه طعمەی آتش شد: خانووەکە کەوتە بەر ئاگرەوە›.

**طعمه‌گذاری** / to'megozārî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کاری تامک دانیان؛ چەشتە نیانەوە؛ چێژە نانەوە لە سەر ڕێگای گیانداران بە قولاب یان داو، بۆ ڕاکێشان و ڕاویان.

**طعن** / ta'n ، ـها/: [عربی]/*اسم.[ادبی]* تانە؛ تەشەر؛ تەشەرە؛ تەشە؛ تەوس؛ توانج؛ تانووت؛ پلار؛ تانێ؛ تیز: ١. کار یا ڕەوتی ناو و نیتکە دۆزینەوە ٢. خراپەبێژێ؛ فڕ.

**طعن‌آلود** / ta'nālûd/: [عربی/ فارسی] *صفت.* تەشەراوی؛ بە تەشەرەوە؛ پڕ تانە و تەشەر ‹سخنان طعن‌آلودی گفت: قسەگەلێکی تەشەراوی گوت›.

**طعن‌آمیز** / ta'nāmîz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بە تانە و تەشەر؛ بە سەرکۆنەوە ‹نگاه طعن‌آمیزی داشت: ڕوانینێکی بە تانە و تەشەری هەبوو›.

**طعن‌ولعن** / ta'n-o-la'n/: [عربی]/*اسم.[ادبی]* تەوس و توانج؛ تانە و تەشەر؛ تیر و تانە ‹نمی‌خواهم مورد طعن و لعن مردم باشم: نامەوێ

بکەومە بەر تەوس و توانجی خەڵکەوە›.

**طعنــه** / ta'ne ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. لەقــەم: ١. سەرکۆنە؛ لۆمە؛ ولە؛ تەوس؛ تیز؛ سەرزەنشت ‹طعنه زدن: سەرکۆنە کردن› ٢. تانە؛ لەوم؛ تەشەر؛ قەرف؛ تانوت ‹طعنەی دوست بدتر از تیغ دشمن است: تانەی دۆس لە تیغی دوژمن خراپترە›.

◙ **طعنــه زدن:** تانــە لێـدان؛ تیــز پێکــردن؛ عەیب گـرتن؛ تـانوت لێدان؛ قـەرفین؛ گەمـە پێکـردن؛ عـەیب لـێ گـرتن ‹همـه بـر او طعنـه می‌زدند که چرا این کار را کـردی: هـەموان تانـەیان لێدەدا کە ئەم کارەت بۆچی کرد›.

**طغرا** / toqrā/: [ترکی]/اسم. ١. تـوغرا؛ لـە خەتـە تەوزێنیەکانی فارسی و عەرەبی کە بـە شـێوەی ئیمزا یـان بـە نـاو بـە کـار دەڕوات ٢. دەسـتە؛ دەفتەر؛ یەکەی ژمـاردنی پـەڕە بایەخـدارەکان ‹یک طغرا چک بانکی مفقود شـده است: دەسـتەیەک چەکی بانکی گوم بووە›.

**طغیان** / toq(i)yān ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ١. دۆخ یان چۆنیەتی لادان لـە ڕێبـازی سـەرەکی یـان دابین‌کراو؛ هەڵدان؛ هەڵکفان؛ گلان؛ سەرکردن ‹طغیان رودخانە؛ طغیان قلم: هەڵدانـی چـەم؛ گلانــی قەڵەم› ٢. شۆرش؛ ڕاپەڕین ‹مردم طغیـان کردنـد و به خیابانها ریختند: خەڵکی شورشیان کرد و ڕژانە نێـو شەقامگەلەوە›.

◙ **طغیـان رودخانـه:** تۆقـە؛ دۆخ یـا ڕەوتی ئـاو سەرکردن؛ ئاو هەڵسان؛ هەڵـدانی چـەم؛ زۆر بوونی لـە ڕادەبـەدەری ئـاوی چـەم و هاتنـە سەری.

**طغیـان قلـم:** *[ادبـی]* گـلانی قەڵـەم؛ گـلانی پێنووس؛ هەڵەی دەستی نووسـەر لـە کـاتی نووسیندا.

**طفره** / tafre ، ـها/: [عربـی]/اسـم. چـاغ و بـەنگ؛ دەسی‌ـدەسی؛ دەستی‌ـدەستی؛ کار یان ڕەوتی خۆ لادانی بە ڕووبینی بۆ جێبەجێ‌کردنی کارێ کە داواکراوە.

◙ **طفـره رفـتن:** خـۆ لـێ لادان؛ چـاغ و بـەنگ کردن؛ دەسی‌ـدەسی کردن؛ دەستی‌ـدەستی کردن؛ لە بەڕێوەبردنی کارێک خۆ لادان ‹هـر روز از دادن طلب مردم طفره می‌رفت: هـەموو ڕۆژێ خوی لە دانەوەی قەرزی خەڵکی لا دەدا›.

**طفل** / tefl ، ـها؛ ـان؛ اطفال/: [عربـی]/اسـم. منـداڵ؛ مناڵ؛ زارۆ؛ زاروو؛ زارۆڵە؛ زاوڵە.

**طفلــک** / teflak ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. ١. زارۆک؛ منداڵــی بچــووک ٢. *[کنـــایی]* بەستەزمان؛ بەسەزوان؛ وشەیەک بـۆ دەربـڕینی دڵسۆزی ‹طفلک تازه داشت عروسی می‌کرد کـه ایـن بـلا بـه سـرش آمـد: بەسـتەزمان تـازە دەیەویـست زەماوەند بکات کە ئەم بەڵایە تووشی بوو›: **طفلکی؛ طفلی** *[گفتاری]*

**طفلکی** / teflakî/: [عربی/ فارسی] ☜ **طفلک ـ٢**

**طفلی** / teflî/: [عربی]/اسم. ١. مناڵـی؛ منداڵـی؛ زارۆیی؛ زارۆکی ٢. ☜ **طفلک ـ ٢**

**طفولیت** / tufûlîyyat, tofûlîyyat/: [عربی]/اسم. منداڵـی؛ مناڵـی؛ زارۆیـی؛ زارۆکـی؛ زاوڵـەیی؛ منداڵــیەتی؛ زاروکــینی ‹دوران طفولیـت را در زادگاهش گذراند: سـەردەمی منداڵـی لـە زێدەکـەی بردە سەر›.

**طفیلی** / tofaylî ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. ١. مڕ و مووشکەر؛ خۆژێ؛ دۆم بلکان؛ مـڵ و مووشـکەر؛ کەسێ کە (لە جێی دابین‌کردنی ژیانی خـۆی) بـە ناڕەوا لـە دەسـڕەنجی خەڵـک دەژی ‹احساس می‌کـنم طفیلـی شـما هـستم: هەسـت دەکـەم مـڕ و مووشــکەری ئێــوەم› ٢. مــشەخۆر؛ خــۆرە؛ زگ‌لەوەڕێن؛ لەمل‌ـەوەڕن؛ لـەگام؛ نـەرمۆ؛ نـانۆ؛ مــووس؛ مووسـەل؛ دەڤدەهـۆڵ؛ کەسـێ کـە بێ‌بانگهێشتن یـان حـەزی کەسـانێک دەبێتـە میوانیـان ٣. پاشـاوخۆر؛ بـەرماوخۆر؛ سـەربار؛ لامێژ؛ چەورە؛ لاورگە؛ لاکوت ‹موجـودات طفیلـی: بوونەوەرە پاشاوخۆرەکان›. هەروەها: **طفیلی بودن؛ طفیلی شدن**

**طلا** / talā/: [عربی]/اسم. زێڕ؛ زەڕ؛ تەلا؛ تلا؛ تەلێ؛ ئـاتی: ۱. تـوخمێکی کیمیـاوی کـانزایی، بـە ژمارەی ئەتومی ۷۹ و کێشی ئـەتومی ۱۹٦,۹٦ بە ڕەنگی زەردی درەوشاوە، چەکوشخۆر و دژ بـە ژەنگـە بـۆ سـکە لێـدان، جـەواهێر سـازی، دەواسـازی و لـە دەسـگاگەلی ئەلـەکتریکیدا بەکاردێ. ناوە لاتینەکەی لـە وشـەی «ئـوروم» واتە ئاڵتوون وەرگیراوە ۲. /ـها/ ئاڵـتوون؛ هـەر یەک لـە بەرهـەمهاتووگـەلی لـێدرووسـکراوی ۳. /مجازی/ شتێکی زۆر پڕ بایەخ.

▣ **طلای بدلی:** زرە زێڕ؛ زێـڕی قەڵـب؛ ئالیـاژی مس و پێنج تا دە لە سەد ڕۆح کـە زۆرتـر بـۆ درووس‌کـردنی جـەواهیراتی قەڵـب بـە کـار دەڕوا.

**طلای سبز:** ۱. زێڕی کەسک؛ زێڕێ کە تێکەڵ بە هێنـدێ کـادمیوم یـان زیـوە ۲. /مجـازی/ لێڕەوار؛ جەنگەڵ؛ جەنەڵ؛ دارستان.

**طـلای سـفید:** ۱. پلاتـین؛ زێـڕی سـپی ۲. /مجازی/ لۆکە؛ پەموو؛ پەمۆ؛ پەمە.

**طلای سکّه:** زێڕێک دەگـەڵ ۹۱,٦ لـە سـەدی زێڕ، هێندێک مس و نەختێ زیو.

**طلای سیاه:** /مجازی/ نەوت؛ نەفت؛ نەوتە.

▣ **طـلا گـرفتن:** (لـە) زێـڕگرتن؛ گرتنـە زێـڕ؛ زەڕگرتن؛ تەڵاگرتن؛ زێـڕپۆش‌کـردن؛ ئاسـتی شتێک بە لاپەڕەیەک لە زێڕ داپۆشـاندن ‹دور تا دورش را طلا گرفتـه بودنـد: دەورانـدەوریان زێـڕ گرتبوو›.

**طـلاآلات** / talā'ālāt/: [عربـی]/اسـم. زێڕەواڵـە؛ ئامێرگەلی چێکراو لە زێڕ: **طلاجات**

**طلائی** / talā'ī/: [عربی] ☜ **طلایی**

**طلاب** / tollāb/: [عربی] جمعِ ☜ **طَلَبه**

**طلاجات** / talācāt/: [عربی/ از عربی] ☜ **طلاآلات**

**طلاساز** / talāsāz ، ـها؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. زێڕینگێڕ؛ زێڕینگەر؛ زەڕگەر.

**طلاسازی** / talāsāzî ، ـها/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. زێڕینگێڕی؛ زێڕینگەری؛ زەڕگەری.

**طلافروش** / talāfurûš ، ـها؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی] /اسم. تەڵافرۆش؛ زێڕفرۆش.

**طلافروشـی** / talāfurûšî ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] /اسم. زێڕفرۆشی؛ تەڵافرۆشی.

**طلاق** / talāq ، ـها/: [عربی]/اسم. تەڵاق؛ تلاق؛ کار و ڕەوتی لە یەک جیا بوونەوەی ژن و مێرد.

▣ **طلاق باین:** تەڵاقێ کە گەڕانـەوە بـەبێ مـارە برینەوە ڕەوا نیە.

**طلاق خُلع:** تەڵاقێ کە ژن بە دانەوەی مارەیی یان بەشێک لە ماڵـی خـۆی بـە مێردەکـەی، ڕازی دەکا تەڵاقی بدا.

**طلاق رِجعی:** تالوق؛ تەڵاقێ کـە لـە مـەودای عیددەدا جێ بۆ گەڕانەوەی هەیە.

▣ **طـــــــلاق دادن:** تـــــــەڵاق دان: ۱. هەڵوەشاندنەوەی بڕیارنامـەی ژنوشـوویی بە ویـستی مێـرد ‹زنـش را طـلاق داد: ژنەکـەی تەڵاق دا› ۲. /مجـازی/ وێـڵ‌کـردن؛ وە لانـان؛ دەست لێ‌بەردان؛ پشت لێکردن ‹مثل ایـن‌کـه درس و مشق را دیگـر طـلاق دادی: وا دیـارە ئیتـر خوێندنت تەڵاق داوە›.

**طـلاق کـسی را گـرفتن:** تـەڵاقی کەسـێک سەندن؛ هەڵپێچانی پیاوێـک بـۆ تـەڵاق دانی ژنەکەی ‹عاقبت طلاق دخترش را گرفت: ئـاخری تەڵاقی کچەکەی سەند›.

**طـلاق گـرفتن:** تـەڵاق سـەندن؛ تـەڵاق لـێ‌گـرتن؛ پـێ تـەڵاق دان؛ لێـک‌جیـا بوونـــەوەی ژن و مێـــرد بـــە ویـــستی ژن ‹شـوهرش معتـاد بـود، طـلاق گرفـت: مێردەکـەی موعتاد بوو، تەڵاقی لێ سەند›.

**طلاقنامه** / talāqnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. تەڵاقنامـە؛ نووسـراوەیەکی ڕەسمـی کـە جـوێ بوونەوەی ژنی تێدا هاتووە.

**طلاق و طلاق‌کشی** / talāq-o-talāqkešî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. /گفتاری/ تـەڵاق و تـەڵاقکاری؛

ململانێ و گێره و کێشەیەک کە بە هۆی تەلاق دان یان تەلاق لێسەندن دێتە دی ‹کارشان بە طلاق و طلاق‌کشی کشید: کاریان کێشایە تەلاق و تەلاقکاری›.

**طلاكار** / talākār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. زێرینگەر؛ زێرینگێر؛ زەرگەر؛ تەلاکار.

**طلاكارى** / talākārî/: [عربی/ فارسی]/اسم. تەلاکاری؛ زێرینگەری: ١. کاری داپۆشاندنی ئاستی شتێک بە تۆژاڵێکی ناسک لە زێڕ ٢. کاری ڕازاندنەوەی نوسخەگەلی خەتی بە ڕەنگی وەکوو شەنگەرف، شین، ژەنگار، ئاوی تەلا یان زێو.

**طلاكوب** / talākûb/: [عربی/ فارسی] صفت. زێڕکوت؛ زێڕکفت.

**طلاكوبى** / talākûbî/: [عربی/ فارسی]/اسم. زێڕکوتی؛ زێڕکفتی: ١. کار و ڕەوتی کوتاندنی کانزا بریقەدارەکان بەتایبەت زێڕ و زێو، بە شێوەی نەخش یان نووسراوە لە سەر ئاستێک ٢. نەخش یا نووسراوە لە پەڕەیەکی ناسکی کانزایی بەسەر ڕووپەڕێکەوە.

**طلايه** / talāye ، ـها/: [از عربی]/اسم. [ادبی] پێشەنگ؛ پێشڕەو؛ ڕەمکێش؛ پێشاهەنگ؛ گرۆیێ کە پێشڕەوی ئەوانی دیکەن.

**طلايه‌دار** / talāyedār ، ـها؛ ـان/: [از عربی/ فارسی] صفت. [ادبی] ڕەمکێش؛ پێشەنگ؛ پێشاهەنگ؛ پێشڕەو؛ جڵەودار؛ جڵەوکێش؛ لە پێشەوەی گرۆیەک بەتایبەت گرۆی سەربازان.

**طلايى** / talāyî/: [عربی] صفت. زێڕین؛ زێڕی؛ تەلایی: ١. درووسکراو لە زێڕ ‹تاج طلایی: تاجی زێڕین› ٢. بە ڕەنگی زەردی درەوشاوە ‹گیسوان طلایی: بسکی زێڕین›. هەروەها: **طلايى‌رنگ** ٣. [مجازی] زۆر شکۆدار و پڕبایەخ ‹دوران طلایی: سەردەمی زێڕین› ❋ زرّین: **طلايى**

**طلب**[1] / talab/: [عربی]/اسم. ١. داوا؛ خوازیاری؛ داخوازی؛ خوازگاری؛ دەرخواست؛ خواست؛ خوازەکی؛ کار یان ڕەوتی خواستن؛ ویستن ‹طلب بخشش؛ طلب یاری: داوای لێبووردن؛ خوازیاری یارمەتی› ٢. /ـها/ قەرز؛ هەقێ کە کەسێ بە سەر کەسێکی‌ترەوە هەیەتی.

▣ **طلب داشتن:** خاوەن‌قەرز بوون.

**طلب كردن:** ویستن؛ داوا کردن؛ خازتن؛ خواستن؛ گەرەک بوون/ بیەی؛ هەرەک بوون ‹از خدا طلب مرگ می‌کرد؛ از مردم یاری طلب می‌کرد: داوای مەرگی لە خودا دەکرد؛ لە خەڵک یارمەتی دەویست›.

**به طلب چيزى درآمدن:** بە شوێن شتێکدا هاتن؛ بۆ شتێک هاتن. هەروەها: **به طلب چيزى رفتن**

**در طلب چيزى بودن:** بە شوێن شتێکدا بوون؛ داواکاری شتێک بوون.

**ـطلب**[2]: پیواژە. ـ خواز؛ ـ خاز؛ ـ واز؛ ـ ویست؛ خوازیار و شوێنکەوتووی شتێک ‹شهرت‌طلب؛ نفع‌طلب: ناوبانگ‌خواز؛ قازانج‌خواز›.

**طلبكار** / talabkār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. خاوەن‌قەرز؛ لاوەکەر؛ داواکار؛ تەڵەبکار. هەروەها: **طلبكارى**

**طلبه** / talabe ، ـها/: [عربی]/اسم. فەقێ؛ فەقی؛ فەقە؛ خوێندکاری زانستی ئایینی.

**طلبيدن** / talabîdan/: [عربی/ فارسی] مصدر. متعدی. // **طلبيدى:** ویستت؛ **مى‌طلبى:** دەتەوێ؛ **بطلب:** بتەوێ// ویستن؛ وایستن؛ گەرەک بوون/ بیەی؛ هەرەک بوون؛ داخواستن؛ خواستن؛ خواسن؛ داواکردن؛ واسەی؛ واستەی: ١. گرکاش‌کردن ‹در آنجا برای خودش آسایش و آرامش می‌طلبید: دەویدا بۆ خۆی سوکنایی و هێمنایەتی دەویست› ٢. خوازیار بوون؛ داواکار بوون ‹از مردم کمک طلبیدم: لە خەڵک یارمەتیم ویست› ٣. [ادبی] بانگ کردن؛ قاوکردن؛ بانگهێشتن‌کردن؛ چڕەی؛ چڕای ‹فرزندان را طلبید و به آنان گفت: ...: منداڵەکانی بانگ کرد و پێیانی

گوت:...› ٤. پێویست بوون ‹موفقیت در هر کاری، برنامەریزی و تلاش می‌طلبد: سەرکەوتن دە هەر کارێکدا، بەرنامەرێژی و تێکۆشانی دەوێ›.
هەروەها: **طلبیدنی**

■ صفت مفعولی: **طلبیده** (ویستراو)/ مصدر منفی: **نطلبیدن** (نەویستن)

**طلسم** / telesm/: [معرب از یونانی]/اسم. بارەژن؛ دەمبەست؛ دایلان؛ تەلیسم: ١. چاچۆڵە؛ شتێ کە هێزێکی جادوویی تێدا خەیاڵ بکرێ ‹یک طلسم به تو می‌دهم کە تو را از بلاها حفظ کند: بارەژنێکت پێ‌دەدەم کە لە بەلا بتپارێزێ› ٢. شوێنی جادووکراو؛ کەسێک یان شتێ کە بکەوێتە بەر هێزێکی جادوویەوە و چۆنایەتی بگۆردرێ ‹این خانه طلسم شده است: ئەم خانووە بارەژن بووە›.

⊡ طلسم را باز کردن/ گشودن ☜ **طلسم را شکستن**

طلسم را شکستن: ١. بارەژن پووچەڵ کردنەوە ٢. *[مجازی]* گرێی کارێک کردنەوە؛ گرفت لە سەر شتێ لابردن ✱ **طلسم را باز کردن/ گشودن**

طلسم شدن: ١. جادوو بوون؛ کەوتنە بەر وزەگەلی جادووییەوە ٢. *[مجازی]* کەوتنە فەرتەنەوە؛ تووشی دۆخی زۆر ئاستەم و بێ‌دەرباز هاتن. هەروەها: **طلسم کردن**

**طلعت** / tal'at/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ١. روخسار؛ چێرە؛ دەم و چاو؛ روومەت؛ وێنە ‹کجا تواند دیدن گوزن طلعت شیر؟: لە چۆناوچۆن کەڵ دەتوانێ روخساری شێر ببینێ؟› ٢. دیمەن؛ روخساری جوان ‹روشنی طلعت تو ماه ندارد: لە تاوی دیمەنت مانگ بێ‌نەسیوە›.

**طلق** / talq/: اسم. ١. ـها/ [معرب از فارسی] دەلق؛ دلق؛ پەرەیەک وەک شووشە کە لە تالک چێ‌دەکرێ ٢. [عربی] پرک؛ ژانی زان؛ ئێشی منداڵ هێنان ٣. تالک؛ سیلیکاتی ئاوداری مەنیەزیوم.

**طلقی** / talqî/: [معرب] صفت. دەڵقی؛ دلقی؛ دەڵقینە؛ لە ماکی دەڵق.

**طلوع** / tulû', tolû'/: [عربی]/اسم. ١. ڕەوتی ئەنگووتن؛ ئەنگوتن؛ هەڵاتن؛ زەیقین؛ هۆرئامەی؛ دەرکەوتن؛ دیاری‌دانی خۆر و هەیف و ئەستێران و تەنە ئاسمانیەکان لە ئاسماندا ٢. *[مجازی]* ڕەوتی دەرکەوتن؛ سەرهەڵدان؛ زیەی ‹طلوع صبح: دەرکەوتنی بەیانی› ٣. سەرەتای ڕۆژ. هەروەها: **طلوع کردن**

**طلیعه** / talî'e ، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* دەسپێک؛ کەبار؛ بەرژەنگ؛ بەرژونگ؛ بەرایی؛ سەرەتای دیاری‌دانی شتێک ‹طلیعەی بهار؛ طلیعەی پیروزی: دەسپێکی بەهار؛ دەسپێکی سەرکەوتن›.

**طماع** / tammā' ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. *[ادبی]* چاوچنۆک؛ چاڤ‌چنۆک؛ چاوبرسی؛ چاڤ‌برسی؛ چاونەزیر؛ چلماس؛ چەڵماس؛ چەڵماسک؛ دەقبەش؛ دل‌بزۆک؛ مووزر؛ تەماحکار؛ کۆدو؛ هەڵپ‌کار؛ پرکێش؛ لێشتۆک؛ هەفهەفی ‹آدم طماع دو بار ضرر می‌کند: مرۆی چاوچنۆک دوو جار زەرەر دەکا›.

**طمأنینه** / toma'nîne/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ١. ئارامشت؛ هەراس؛ خۆراس؛ ئاسوودەیی؛ ئارامی؛ هێمنایەتی؛ ئۆقرەیی؛ سوکنایی ٢. هەندر؛ دڵنیایی؛ ئارخەیانی؛ خاترجەمی؛ هەداریەک کە هاورێیە دەگەڵ دڵ‌ئارامیدا.

**طمث** / tams/: [عربی]/اسم. *[نامتداول]* مەهک؛ مەهکی؛ کنج؛ بێ‌نوێژی؛ نەخۆشی مانگانەی ژنان.

**طمطراق** / tomtarāq, tomtorāq/: [؟]/اسم. *[ادبی]* دەبدەبە و کەبکەبە؛ شکۆ و گەورەیی وێرای خۆ نیشاندان.

**طمع** / tama' ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. چاوچنۆکی؛ چاڤ‌چنۆکی؛ چاونەزیری؛ هەڵپ ‹طمع او حد و

اندازه ندارد: چاوچنۆکی ئەو لە ڕادە بەدەرە›.
٢. چاوچنۆکی؛ چاڤچنۆکی؛ هەڵپە؛ ئاز؛ خوازەلۆکی؛ دۆخ یا ڕەوتی قورم لە شتێک خۆشکردن کە هی کەسیتر بێ ٣. [مجازی] خەیاڵپلاو؛ فاکوفیک؛ خەیالاتی بەتاڵ؛ خەیاڵی خاو؛ تەما ‹به طمع ریاست افتاده بود: خەیاڵپلاوی سەرۆکی کەوتبووە سەری›.

◙ **طمع خام**: فاکوفیک؛ خەیالاتی بەتاڵ؛ خەیاڵپلاو؛ خەیاڵی خاو؛ ئامانجی بێهۆ و خاو.

◙ **طمع بریدن**: چاو لێپۆشین؛ دەس لێبەردان؛ دەس لێشۆردن ‹من از آن پول طمع بریدم، اگر گرفتی مال خودت: من لەو پارە چاوم پۆشیوە، ئەگەر وەرتگرت بۆ خۆت›.

**طمع کردن/ بستن**: ددان تیژکردن؛ تەماح کردن؛ قورم خۆشکردن؛ تەما تێکردن.

**به طمع افتادن**: کەوتنە تەماوە؛ هەڵخرانی ئاوات و ئارەزوو بۆ گەیشتن بە شتێک.

**طمعکار** / tama'kār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت*. چاوچنۆک؛ چاڤچنۆک؛ چاوبرسی؛ چاڤبرسی؛ چڵماس؛ چەڵماس؛ چاونەزیر؛ کۆدوو؛ دەڤبەش؛ پرکێش؛ لێشتۆک؛ هەفهەفی؛ هەڵپکار؛ تەماحکار. هەروەها: **طمعکاری**

**طمع‌ورزی** / tama'varzî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم. [ادبی]* چاوچنۆکی؛ تەماکاری؛ چاونەزیری؛ کار یان ڕەوتی تەماکردن لە شتێک.

**طناب** / tanāb/: [عربی] ☜ **تناب**

**طناب بازی** / tanāb.bāzî/: [عربی/ فارسی] ☜ **تناببازی**

**طناب پیچ** / tanābpîč/: [عربی/ فارسی] ☜ **تنابپیچ**

**طناز** / tannāz ، ـان/: [عربی] *صفت. [ادبی]* بەلەنجە و لار؛ چەلەنگ؛ شەنگ؛ تایبەتمەندی ژن یان کچێ کە لەشی جوان و ڕەوتی لەبارە. هەروەها: **طنازی**

**طنبور** / tambûr, tanbûr/ ☜ **تنبور**

**طنبی** / tanabî/ ☜ **تنبی**

**طنز** / tanz ، ـها/: [عربی] *اسم*. تیز؛ تەوزە؛ لێب؛ حەنەک؛ هەنک؛ فەنەک؛ قەرف؛ ئەوەی لایەنگەلی ناڕاست، نەگونجاو یان ناڕەوای دیاردەیەک بە شێوەی گاڵتە و گەپ دەنوێنێ ‹مقالەی طنز؛ نمایش طنز: وتاری تیز؛ نومایشی تیز›.

**طنزآلود** / tanzālûd/: [عربی/ فارسی] *صفت*. حەنەکاوی؛ گۆڵمەزاوی؛ تیزانە؛ بە تیز؛ هاوڕێ لەگەڵ تیز ‹حکایت طنزآلود: چیرۆکی حەنەکاوی›.

**طنزآمیز** / tanzāmîz/: [عربی/ فارسی] *صفت*. حەنەکاوی؛ تیزانە؛ تێکەڵ بە تیزەوە ‹مقالەی طنزامیز: وتاری حەنەکاوی›.

**طنزآور** / tanzāvar/: [عربی/ فارسی] ☜ **طنزنویس**

**طنزپرداز** / tanzpardāz/: [عربی/ فارسی] ☜ **طنزنویس**

**طنزگو** / tanzgû ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] *اسم*. حەنەکچی؛ حەنەکبێژ؛ قسەخۆش؛ لێبۆک؛ زۆرزان لە قسەی جەفەنگیدا.

**طنزنویس** / tanznevîs ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم*. حەنەکنووس؛ تیزنووس؛ نووسەری نووسراوەگەلی تیز: **طنزآور؛ طنزپرداز**

**طنزنویسی** / tanznevîsî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. حەنەکنووسی؛ تیزنووسی؛ کاری تیز نووسین؛ قەرفین.

**طنطنه** / tantane/: [عربی] *اسم*. ١. هنگ و ونگ؛ سەنتەنە؛ دەبدەبە؛ شکۆ و جەلالی شاماتی هاوڕێی گەورەپیاو ٢. ناوبانگ.

**طنطور** / tantûr/: [فرانسوی] ☜ **تنتور**

**طنین** / tanîn/: [عربی] *اسم*. زایەڵە: ١. پێزن؛ گومنی؛ تایبەتمەندی دەنگ (وەک دەنگی زەنگ) سەرچاوەگرتوو لە

در عجب ماندن ☜ **عجب آمدن**
**عجب**[٢]: *صوت [گفتاری]* پەکوو؛ ئەک؛ تەح؛ تەحا؛ عەکا؛ حا؛ حەهـ ؛ پیەح؛ پیاح؛ هەلا ــ هەلا پیا؛ پیک ‹عجب! چە آدمهایی پیدا می‌شوند: پەکوو! چ کەسانێ هەلدەکەون›.
**عجب** / 'ocb/: [عربی] *اسم. [ادبی]* لووت‌بەرزی؛ ئاخایۆکی؛ ترزلی؛ دەمارزلی؛ خۆ بە زل‌زانی.
**عجبا** / 'acabā/: [عربی] *صوت.* ئەک؛ تەح؛ حەهـ ؛ تەحا؛ پەکوو؛ پیەح؛ پیاح؛ پیا؛ پیک؛ ئەحا؛ عەک؛ ئاک؛ دەک؛ عاک و داک ‹عجبا از این همە شجاعت: ئەک لەم هەموو ئازایەتیە›.
**عجز** / 'acz/: [عربی] *اسم. [ادبی]* داماوی؛ داماگی؛ لێنەهاتوویی؛ لێنەهاتگی؛ بێ‌دەسەلاتی ‹اظهار عجز کرد و تن بە مبارزە نداد: داماوی خۆی دەربڕی و ملی نەدایە ململانێ›.
**عجز و التماس** / 'acz-o-eltemās,'ecz-/: [عربی] *اسم. [گفتاری]* تکا و لالە؛ شفا و لالە؛ لالە و پاڕە؛ ڕاڤەکی؛ ڕاڤەر؛ پاڕانەوەی لە سەر یەک لەگەڵ گریاندا ‹دزد آن‌قدر عجز و التماس کرد کە صاحبخانە دلش سوخت: دزە هێندە تکا و لالەی کرد، خاوەن‌ماڵەکە دڵی بۆ سووتایەوە›.
**عجزە** / 'acaze/: [عربی] جمعِ ☜ **عاجز-٢**
**عجلە** / 'acale، ـها/: [عربی] *اسم.* پەلە؛ پەل: ١. لەز؛ لەژ؛ لەپ؛ بەل؛ لەز ــ لەز؛ پەلەپەل؛ دێرادێرە؛ خۆش؛ وەش؛ لە؛ لەزاهی؛ هەڵپرووز؛ لەزلێ؛ چلزیە؛ دەستوبرد؛ دەس‌وبرد؛ بریو؛ بریڤ؛ تاو؛ هەڕەمە ‹عجلە کن! دیر شد: پەلە کە! درەنگە› ٢. هەڵپە؛ بێ‌تاقەتی ‹چقدر عجلە داری؟: چەندە پەلەتە؟›.
▣ **عجلە بودن:** *[گفتاری]* بە پەلە بوون؛ بە لەز بوون ‹این کار عجلە است: ئەم کارە بە پەلەیە›.
**عجلە داشتن:** پەلە بوون؛ پەلەپەل هەبوون؛ پەلەز بوون؛ لەزاهی بوون ‹عجلە داشت زودتر برود: پەلەی بوو زووتر بڕوا›.
**عجلە کردن:** لەپین؛ لەزین؛ لەزاندن؛ پەلەپەل‌کردن؛ پەلە کردن/ کەردەی؛ هنجراندن؛ دێرادێرەکردن؛ لەزکرن؛ بەلەسە بوون.
**عجم** / 'acam/: [عربی] *اسم. [قدیمی]* عەجەم: ١. فارس؛ ئێرانی ٢. غەیری عەرەب؛ ناعەرەب.
**عجوزە** / 'acûze، ـها/: [عربی] *صفت. [گفتاری]* کۆنەفرتۆڵ؛ بی‌بی‌جان‌جادوو؛ پیرەبووک؛ پیرعەبۆک؛ قاڕی؛ قاڕیە؛ قاڕیەکۆن؛ دەڵەقۆڕ؛ زۆر پیر و ناشیرین (لەمەڕ ژنانەوە).
**عجول** / 'acûl، ـها/: [عربی] *صفت.* بەپەلە؛ هەوڵ؛ پەلەپەل؛ پەلەپەلکەر؛ هەڵەشە؛ هەڵەشەیی؛ زەپرتی؛ ناحەواو؛ نەچەلان؛ ودودە ‹آدم عجول یک کار را دو بار می‌کند: مرۆی بەپەلە، کاری دووبارەیە›.
**عجولانە**[١] / 'acûlāne/: [عربی] *صفت.* پەلەپەل؛ بە پەلە؛ هەڵپەهەڵپ؛ بە هەڵپە؛ بە هەڵەشە؛ هەڵەشەیانە؛ بلەز و بەز؛ بریو ــ بریو؛ بە هەڵەداوان ‹کار عجولانە: کاری پەلەپەل›.
**عجولانە**[٢]: *قید.* بەپەلە؛ پەلەپەل؛ بەلەسە؛ بەهەڵەشەیی؛ هەرشێتە؛ بەلەز؛ بە توندی؛ لەزالەز ‹عجولانە تصمیم نگیر: بەپەلە بڕیار مەدە›.
**عجیب** / 'acîb/: [عربی] *صفت.* سەیر؛ سەمەرە؛ هێدان؛ ئەلاجەوو؛ ئەلاجەوی؛ بەلاجەوی؛ یەمان؛ سۆزرەت؛ سۆسرەت؛ مۆسترە؛ حەپەسێن؛ ئەلامەت؛ هەژەند؛ دایلان؛ هەمەت؛ گرتۆلە؛ ناوازە؛ عەجەو؛ عەجیب.
**عجیب‌الخلقە** / 'acîbolxelqe، ـها/: [عربی] *صفت.* هۆڕ؛ پێژەک؛ سەیروسەمەرە؛ بە پێکهاتەی لەشی یان ئەندامانی نائاسایی ‹کودک عجیب‌الخلقە: کۆرپەی پێژەک›.
**عجین** / 'acîn/: [عربی] *صفت.* ئاوێتە؛ ئامێتە؛ تێکەلاو؛ تێکەڵ؛ تێکل؛ تەفل.
▣ **عجین شدن:** تێکەڵ بوون؛ کەرچلین؛ ڤەستران؛ تێکەلاو بوونی شتێک لەگەڵ

شتێکی‌تردا، بە جۆرێک کە ببنە یەک شت و لێک جیا نەکرێنەوە ‹آن عشق با جانش عجین شده است: ئەو ئەوینە تێکەڵی گیانی بووە›. هەروەها: **عجین بودن؛ عجین کردن**

**عداد** / 'edād/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* ئەژمار؛ هەژمار؛ ژمار ‹در عداد چند نفری بود کە بە آنجا رفت‌وآمد می‌کردند: لە ئەژماری چەن کەسێدا بوو کە ئاموشۆی ئەوێیان دەکرد›.

**عدالت** / 'edālat, 'adālat/: [عربی]/*اسم.* داد؛ دادگەری؛ دادیەری؛ دادپەروەری؛ عەدالەت؛ ئەدالەت ‹انوشیروان در ادبیات فارسی بە عدالت معروف است: ئەنووشیروان لە وێژەی فارسیدا بە دادگەری ناسراوە›.

**عدالت‌پرور** / 'edālatparvar, 'adālat-/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دادپەروەر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە ببێتە هۆی سەرهەڵدان و گەشەکردنی داد. هەروەها: **عدالت‌پروری**

**عدالت‌پیشە** / 'edālatpîše, 'adālat-/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دادپیشە؛ دادگێڕ؛ دادگەر؛ دادڤان ‹قاضی عدالت‌پیشە: دادوەری دادپیشە›.

**عدالتخواه** / 'edālatxāh, 'adālat-/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دادخواز؛ دادواز؛ خوازیار و هۆگری داد و حوکمی ڕەوا. هەروەها: **عدالتخواهی**

**عدالت‌گستر** / 'edālatgostar, 'adālat-/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دادپەروەر؛ ڕێ‌خۆشکەری پەرەسەندن و گەشەکردنی داد. هەروەها: **عدالت‌گستری**

**عداوت** / 'edāvat, 'adāvat، ـها/: [عربی] /*اسم.* نەیاری؛ دژایەتی؛ دژمنی؛ دوژمنی؛ دژمەنی؛ دژمنایەتی؛ دشمنایەتی؛ دوژمنایەتی؛ بیڤک.

▣ **عداوت داشتن:** دژایەتی بوون؛ نەیاری هەبوون؛ دژمنایەتی هەبوون ‹سالها با آن خانوادە عداوت داشت: ساڵەها لەگەڵ ئەو ماڵە دژایەتی بوو›.

**عداوت کردن:** دژمنایەتی/ دژایەتی/ دژبەری کردن؛ دژمنی کردن؛ دوژمنایەتی کردن ‹با هم عداوت می‌کردند: دژمنایەتی یەکیان دەکرد›.

**عدد** / 'adad، ـها؛ اعداد/: [عربی]/*اسم.* ژمارە؛ شمارە؛ هەژمار؛ ئەژمارە: ۱. هەر یەک لەو وشانە بۆ بژاردن بە کار دێن (وەک: یەک، هەشت، هەزار و...) ۲. هەر یەکە لەو نیشانانە کە بۆ ژمارە لێ‌دان بە کار دێن ‹عددها را از ۱ تا ۱۰ مرتب کنید: ژمارەکان لە ۱ تا ۱۰ ڕیز بکەن› ۳. یەکەیێک لە زانستی بیرکاریدا ‹عدد اصلی: ژمارەی سەرەکی› ٤. نیشانە یان کۆمەڵێ لە نیشانە کە چەنیەتیەک دەناسێنن ‹عدد آوگادرو: ژمارەی ئاووگادرۆ›.

▣ **عدد اتمی:** ژمارەی ئەتومی؛ ژمارەی دیاریکەری هەندی پروتۆن لە ناوکی ئەتومی توخمێکدا.

**عدد اصلی:** ژمارەی سەرەکی؛ ژمارەی نیشاندەری جێگای سەرەکی شتێک.

**عدد اصم** ☜ **عدد گنگ**

**عدد اول:** ژمارەیەک کە تەنیا بە سەر یەک و خۆیدا دابەش ببێتەوە.

**عدد پی:** ژمارەی پی؛ ۳٫۱٤ کە بەرانبەرە بە دابەش‌کردنی دەوری جەغزێک بە سەر کۆپار(قوتر)یدا.

**عدد ترتیبی:** ژمارەی تەرتیبی؛ ژمارەیەک کە لە نێو کۆمەڵێکدا جێگا و پلەی یەکێکیان نیشان دەدا (وەک سێیهەم، پەنجایەم...).

**عدد تک** ☜ **عدد فرد**

**عدد جرمی** ☜ وزن اتمی، **وزن**

**عدد جفت** ☜ **عدد زوج**

**عدد حقیقی:** ژمارەی ڕاستەقینە؛ هەر

ژمارەیەک (لە تەواو یان لێڵ).

**عدد درست** ☜ **عدد صحیح**

**عدد زوج:** ژمارەی جووت؛ ژمارەیێ کە بە سەر دوودا دابەش بێ: **عدد جُفت**

**عدد صحیح:** ژمارەی تەواو؛ هەر ژمارەیێ کە نوێنەری چەندیەتیەکی تەواوە.

**عدد طبیعی:** ژمارەی یەک و ئەوی بە شوێنیدایە، بێبڕانەوە.

**عدد فرد:** ژمارەی تاک؛ ژمارەیێ کە نیوەی ناکاتە ژمارەیەکی تەواو، یان ژمارەیەک کە بەسەر دوودا دابەش نابێ: **عدد تک**

**عدد گنگ:** ژمارەی لێڵ؛ ژمارەی کوێر؛ ژمارەیەک کە بە هیچ بارێکدا نەچێتەوە سەر ژمارەیەکی تەواو: **عدد اصم**

**عدد گویا:** ژمارەی وێژا/ ڕوون؛ ژمارەیەک کە لە بە سەر یەک دابەش بوونی دوو ژمارەی تەواو هاتۆتەوە.

**عدد منفی:** ژمارەی کەمتر یان پچووکتر لە سیفر.

عددهای اصلی و ترتیبی

(ژمارەگەلی سەرەکی و تەرتیبی)

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٠ | سیفر | — | — |
| ١ | یەک | یەکەم | یەکەمین |
| ٢ | دوو | دووهەم | دووهەمین |
| ٣ | سێ | سێهەم | سێهەمین |
| ٤ | چوار | چوارەم | چوارەمین |
| ٥ | پێنج | پێنجەم | پێنجەمین |
| ٦ | شەش | شەشەم | شەشەمین |
| ٧ | حەوت | حەوتەم | حەوتەمین |
| ٨ | هەشت | هەشتەم | هەشتەمین |
| ٩ | نۆ | نۆیەم | نۆیەمین |
| ١٠ | دە | دەیەم | دەیەمین |
| ١١ | یازدە | یازدەهەم | یازدەهەمین |
| ١٢ | دوازدە | دوازدەهەم | دوازدەهەمین |
| ١٣ | سێزدە | سێزدەهەم | سێزدەهەمین |
| ١٤ | چواردە | چواردەهەم | چواردەهەمین |
| ١٥ | پازدە | پازدەهەم | پازدەهەمین |
| ١٦ | شازدە | شازدەهەم | شازدەهەمین |
| ١٧ | حەڤدە | حەڤدەهەم | حەڤدەهەمین |
| ١٨ | هەژدە | هەژدەهەم | هەژدەهەمین |
| ١٩ | نۆزدە | نۆزدەهەم | نۆزدەهەمین |
| ٢٠ | بیست | بیستەم | بیستەمین |
| ٣٠ | سی | سیەم | سیەمین |
| ٤٠ | چل | چلەم | چلەمین |
| ٥٠ | پەنجا | پەنجایەم | پەنجایەمین |
| ٦٠ | شەست | شەستەم | شەستەمین |
| ٧٠ | حەفتا | حەفتایەم | حەفتایەمین |
| ٨٠ | هەشتا | هەشتایەم | هەشتایەمین |
| ٩٠ | نەوەد | نەوەدەم | نەوەدەمین |
| ١٠٠ | سەد | سەدەم | سەدەمین |
| ١٠١ | سەدویەک | سەدویەکەم | سەدویەکەمین |
| ٢٠٠ | دووسەد | دووسەدەم | دووسەدەمین |
| ٣٠٠ | سێسەد | سێسەدەم | سێسەدەمین |
| ٤٠٠ | چوارسەد | چوارسەدەم | چوارسەدەمین |
| ٥٠٠ | پێنسەد | پێنسەدەم | پێنسەدەمین |
| ٦٠٠ | شەشسەد | شەشسەدەم | شەشسەدەمین |
| ٧٠٠ | حەوسەد | حەوسەدەم | حەوسەدەمین |
| ٨٠٠ | هەشسەد | هەشسەدەم | هەشسەدەمین |
| ٩٠٠ | نۆسەد | نۆسەدەم | نۆسەدەمین |
| ١٠٠٠ | هەزار | هەزارەم | هەزارەمین |
| ٥٠٠٠ | پێنجهەزار | پێنجهەزارەم | پێنجهەزارەمین |
| ١٠٠٠٠ | دە هەزار | دە هەزارەم | دە هەزارەمین |
| ١٠٠٠٠٠ | سەدهەزار | سەدهەزارەم | سەدهەزارەمین |
| ١٠٠٠٠٠٠ | یەکملیۆن | یەکملیۆنەم | یەکملیۆنەمین |

▣ **عددی نبودن:** *[مجازی]* هیچ/ هیچێک نەبوون؛ بنیادەمێکی وا نەبوون؛ هیچ سەگێ نەبوون؛ خاوەن هیچ بایەخ و بەهایەک نەبوون ‹او که در برابر من عددی نیست: ئەو خۆ لە ئاست مندا هیچ نیە›.

**عددشماری** / adadšomārî'/: [عربی/ فارسی]/اسم. ژمارەبژێری؛ کار و ڕەوتی ژماردنی شت کە ڕەنگە دوانی، دەیی یا شەستدانەیی یان هەر جۆرێکی‌تر بێ.

**عددنویسی** / adadnevîsî'/: [عربی/ فارسی]/اسم. ژمارەنووسی؛ ئەژمارنووسی: ١. کار یان ڕەوتی نووسینی ژمارە ‹در کلاس اول عددنویسی را بە نوآموزان یاد می‌دهند: لە پۆلی یەکەمدا ژمارەنووسی فێری نۆفێران دەکەن› ٢. دەزگایێ بریتی لە نیشانە، ڕێ و ڕەوشت و چۆناوچۆنی دیاریکراو بۆ نووسینی ژمارە.

**عـددی** / adadî'/: [عربی] صفت. ژمارەیی؛ شمارەیی؛ هەژماری؛ ئەژماری؛ پێوەندیدار یان سەر بە ژمارەوە.

**عدس** / adas' ، ـها/: [عربی]/اسم. نیسک؛ نسک؛ نیسکە؛ نژی؛ نوژی؛ نژوو؛ نووژی؛ نوویژی؛ نووژی؛ نوژووی؛ نوژوی؛ مژوی؛ مێژوی؛ مێژوێ؛ مژوی؛ مەرژی؛ مارژی؛ مەرجوو؛ مارجوو؛ مەرجی؛ میشەوش؛ ڕۆژیک؛ وانج: ١. ڕوەکێک لە بنەماڵەی نۆک و باقلە بە گەڵای درێژ و کولکن و میوە وردیلەی خڕ و لووسەوە ٢. تووی ئەو ڕوەکە کە وردیلەیەکی لووس و خڕە و دانەوێڵەیەکی خۆراکیە: **مَرجُمَک**

**عدس‌آبی** / adase'ābî' ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. بژاڵ؛ گیا مراوی؛ نیسکی ئاوی؛ تیرەیێ گیای ئالیکی ئاوژی، بەبێ کۆتە یان گەڵای دیارەوە کە بە شێوەی کۆمەڵ بە دەوری چەم و زەلکاودا دەڕوێ.

**عدس‌پلو** / adaspolow, -polo:'/ [عربی/ فارسی] اسم. نیسک‌پلاو؛ نژێ‌پلاو؛ نیسکەپلاو؛ جۆرێک پلاوی تێکەڵ بە نیسک، گۆشت و جارجاریش کشمیشی سوورەوەکراو.

**عدسک**/ adasak'/:[عربی/ فارسی]/اسم. ١. نیسکە؛ نیسکی برژاو کە وەک چەرەس دەیخۆن ٢. *[گیاه‌شناسی]* نیسکۆکە؛ وردەخاڵی سەر لاسک و ڕیشەی برێ گیا کە لە گۆڕانەوەی گاز لە شانەگەلی ناوەکی‌دا دەوریان هەیە ٣. ☜ **لنز-٢**

**عدسی** / adasî'/: [عربی]/اسم. ١. ـها/*[فیزیک]* نیسکە؛ مشراق؛ لەتە ماکێکی ڕوونی یەک یا هەر دوولا کەوانەیی، کە بە لێدرانی دەستەتیشکێکی هاوشان، تیشکەکان پێک کۆم یان لێک بلاو دەکاتەوە ٢. ـها/*[کالبدشناسی]* نیسکە؛ ئەندامەیەکی ڕوون لە چاوی مۆرەداراندا کە کاری وێکهێنان لە چاودا دەکا: **عدسیّه** ٣. نیسکین؛ نیسکاو؛ نیسکەینە؛ نژیاو؛ نژیەو؛ مشەوشی؛ شۆرباونیسک؛ چێشتی نیسک.

**عدسیه** / adasîyye'/: [عربی] ☜ **عدسی -٢**

**عدل**[1] / adl'/: [عربی]/اسم. ١. داد. بەرانبەر: **ظلم** ٢. ـها/ عەدڵ؛ تا؛ لنگ؛ لنگە؛ لینگ؛ خەردە؛ قرناخ؛ کۆتک؛ تاسەوی؛ کالای پێچراو بۆ گواستنەوە یان بەستە کالای هەناردەیی ٣. عەدڵ؛ تا؛ لنگە؛ کالای لە سەر یەک چنراو.

▣ **عدل بستن** ☜ **عدل‌بندی**

عدل کردن: سەر یەک چنین؛ قەڵاپەچن کردن؛ تا کەڵە/ کەڵەک کردن؛ ڕێک هەڵچنین لە سەر یەکتر (سەبارەت بە کالا).

**عـدل**[2]: قید. *[گفتاری]* ڕێک؛ ڕاست؛ ڕاس؛ ڕووت‌وراست؛ ڕێک‌وراس؛ بێ‌کەم‌وکووڕی؛ وردبینانە و ڕێک‌وپێک ‹عدل شد هزار تومان؛ عدل خورد بە پیشانی آزاد: ڕێک بووە هەزار تمەن؛ ڕاست دای لە سەر هەنیەی ئازاد›.

**عدل‌بندی** / adlbandî'/: [عربی/ فارسی]/اسم. تابەندی؛ کار یان ڕەوتی تا چنین.

**عدلیـه** / adlîyye'/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* مەزرینگەی داد؛ دادگا.

**عدم**/ adam'/: [عربی]/اسم. ١. دۆخ یان چۆنیەتی نەبوون ‹عدم امنیت: نەبوونی هێمنایەتی› ٢. نەبوو؛ نەوو؛ نەوگ؛ نینۆ؛ چنا؛ نەبیەی؛ نابووری ‹دیار عدم: وڵاتی نەبوو›.

**عدم** / 'adame/: [عربی] حرف. نەبوونی؛ نەبیە؛ نەبوونی شتێ ‹عدم امکانات؛ عدم آشنایی: نەبوونی پێداویستی؛ نەبوونی ئاشنایی›.

**عدو** / 'adû ، ـها؛ اعدا/: [عربی]/اسم. [ادبی] دوژمن؛ دژمن؛ دژمەن؛ دوشمن؛ دشمن؛ نەیار؛ خەنیم؛ قانڕ؛ گاقبەر ‹عدو شود سبب خیر اگر خدا خواهد: دوژمن هۆی سەرکەوتن دەبێ، ئەگەر خودا بیهەوێ›.

**عدوان** / 'odvān/: [عربی]/اسم. [ادبی] دژمنی؛ دوژمنی؛ دشمنی؛ دوژمنایەتی؛ دژمنایەتی.

**عدوانی** / 'odvānî/: [عربی] صفت. [حقوق] نەیارانە؛ دوژمنانە؛ دوشمنانە؛ دژمەنانە؛ دژمنئاسا؛ چەشنی دوژمن ‹تصرف عدوانی: داگیرکاری نەیارانە›.

**عدول** / 'udûl, 'odûl/: [عربی]/اسم. [ادبی] سەرپێچی؛ لادەری؛ ملپێچی؛ بێگوێیی؛ روو وەرگێری ‹عدول از قانون: سەرپێچی لە قانوون›.
هەروەها: **عدول کردن**

**عده** / 'edde/: [عربی]/اسم. ١. ئەژمار؛ هەژمار؛ ژمار ‹عدەی آنها زیاد بود: ئەژماریان زۆر بوو› ٢. [فقه] ئاقێر؛ حەییە؛ ماوەیێ کە ژن پاش تەلاق یان شوو مردن مافی مێردکردنەوەی نیە: **عِدّە**

**عده** / 'odde/: [عربی] ☜ **عِدّە_٢**

**عدەای** / 'edde'î/: [عربی] ضمیر. هێندێ؛ هێندێک؛ هەندێ؛ هەندێک؛ هندی؛ چەندێ؛ چەندێک؛ بڕێ؛ بڕێک؛ بڕێو؛ جەماعەتێو؛ ئەژمارێکی نادیار لەوەی کە هێمای پێکراوە ‹عدەای می‌گفتند او را نمی‌شناسند: هێندێ دەیانگوت نایناسن›.

**عدیده** / 'adîde/: [عربی] صفت. ئێجگار زۆر؛ فراوان؛ فرە و فراوان؛ زۆر فرە؛ مشە؛ مشەمەر؛ زۆر و زەمەند؛ زۆر و زەبەند ‹کتابهای عدیده: کتێبی ئێجگار زۆر›.

**عدیل** / 'adîl/: [عربی]/اسم. [ادبی] هاوتا؛ هامتا؛ وێنە؛ چەشن؛ هاوشێوە؛ هاوچەشن؛ باندەس ‹او را در شجاعت و متانت عدیل و نظیری نبود: بۆ ئازایەتی و هێمنی هاوتا و وێنەی نەبوو›.

**عذاب** / 'azāb ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. ئازار؛ ڕەنج؛ عەزاو؛ ئازاو؛ عەزاب؛ ئوزۆر؛ چەرمەسەری؛ چەرمەسەرێ؛ کرا و کۆش ‹خیلی عذاب کشیدم: زۆرم ئازار چەشت› ٢. سزا؛ ئەشکەنجە؛ شکەنجە؛ جەزرەبە؛ جەزرەوە؛ جەزیە ‹مرا عذاب داد: ئەشکەنجەی کردم›.

▣ **عذاب دادن:** ئەشکەنجە دان؛ ئازاردان؛ جەزرەبە دان؛ ئاراندن؛ گەهراندن؛ چەوساندنەوە؛ چرووساندنەوە؛ ئەنراندن؛ ئەرناندن؛ کرا و کۆش دان؛ تەرپلاندن؛ ئێشاندن؛ ئازار پێدان.

**عذاب کشیدن:** جەزرەبەکێشان؛ عەزاو کێشان؛ کرا و کۆش دیتن؛ ئەنرین؛ ئەشکەنجە چەشتن؛ ئازار چەشتن؛ ئازار دیەی؛ دەوسین.

**عذار** / 'ezār ، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] دیم؛ ڕوومەت؛ لاجانگ؛ جنیک؛ چار؛ سیما؛ ڕوو؛ چێرە؛ دەم و چاو.

**عذب** / 'azb/: [عربی] صفت. [نامتداول] گوارا؛ خۆش؛ ڕانەرم؛ خۆشگەوار؛ زەلاڵ.

**عذر** / 'ozr ، ـها؛ معاذیر/: [عربی]/اسم. ١. بیانوو؛ بیانک؛ بیانکە؛ بیانگر؛ گرنە؛ گرۆ؛ ویانی؛ ویانە؛ بیانی؛ لام؛ عوزر؛ دەسەک؛ دەسپێچک و بەڵگەیێ کە بۆ پاسای گوناح یان هەڵە دەیهێننەوە، بەشکوو داوەری دیتران بگۆڕێ ‹عذر من فوت یکی از خویشانم بود: بیانووم مردنی خزمێکمان بوو› ٢. لێبوردانە؛ داوای لێبوردن.

▣ **عذر بدتر از گناه:** ویانی لە تاوان خراتر؛ عوزر لە گونا بەترەفتر؛ بیانووی لە تاوان ناڕەوا و نەشیاوتر.

**عذر موجه:** بیانی ڕەوا؛ دەسپێچکی بەجێ.

▣ **عذر آوردن:** بیانوو هێنانەوە؛ بیانک

هاوردنه‌وه؛ عوزر هێنانه‌وه؛ لام هـاوردن؛ بـڕ و بیانک تاشین ‹وقتی خواستند برای تعمیر مدرسه پول جمع کنند، هـر کسـی عـذری آورد و پـول نـداد: کاتێ ویستیان بۆ چا کردنه‌وه‌ی قوتابخانه پاره کۆ وه‌که‌ن، هه‌ر که‌سێ بیانوویه‌کی هێنایه‌وه و پاره‌ی نه‌دا›.

**عـذر خواسـتن:** ١. داوای لێبـووردن کـردن ٢. *[مجـازی]* بیانوو هێنانه‌وه؛ بیانک هاوردنه‌وه؛ پێشنیارێک وه‌رنه‌گرتن.

**عذر کسـی را خواسـتن:** که‌سـێ جـواوکردن؛ ده‌رکردنی که‌سێک؛ ڕه‌هه‌نانـدن؛ که‌سـێ لـه جێگایه‌ک وه لانـان ‹کـارش خـوب نبـود، امـروز عذرش را خواستم: کاری باش نه‌بوو، ئـه‌وڕۆ جـواوم کرد›.

**عذرخواهی / ozrxāhî'** ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* عوزرمایی؛ کار و ڕه‌وتی داوای لێبووردن کردن.

⊡ **عذرخواهی کـردن:** داوای لێبـووردن کـردن؛ عوزر هێنانه‌وه ‹آزاد عذرخواهی کـرد و گفـت فـردا شـب مهمـان دارد: ئـازاد داوای لێبـووردنی کـرد و گوتی سبه‌ی‌شه‌و میوانی هه‌یه›.

**عــذوبت / uzûbat, 'ozûbat'/':** [عربـی]/*اسـم.* *[نامتـداول]* گـوارایی؛ خـۆش‌گـواری؛ ڕانـه‌رمی؛ زه‌لالی.

**عـر / ar'/':** *صـوت.* زه‌ڕ؛ زه‌ڕه؛ زڕه؛ سـه‌ڕ؛ سـه‌ڕه؛ هه‌ڕه؛ زه‌ڕه‌ی که‌ر.

⊡ **عـر زدن:** سـه‌ڕاندن؛ هه‌ڕانـدن؛ سـه‌ڕه‌ی: ١. *[تعـریض]* بـه ده‌نگـی بـه‌رز گریـان ٢. زه‌ڕ لێدان؛ سه‌ڕه لێدان؛ زه‌ڕه‌زه‌ڕکردن؛ زه‌ڕانـدن؛ سـه‌ڕانن؛ سـه‌ڕین؛ هـه‌ڕانن؛ زاته‌نـه کـردن؛ سـه‌ڕای؛ سـه‌ڕنه‌ی؛ زرایـش؛ زڕی‌ئامـایش؛ زراینه؛ هه‌ڕه‌هه‌ڕکردن: **عرـ عر زدن**

**عرابه / arrābe'/':** [معرب از فارسی] ☜ **ارّابه**

**عـراده / arrāde'** ، ـهـا/: [عربی]/*اسم.* ١. ئه‌ڕانـه؛ عه‌ڕانه؛ ئه‌ڕاده؛ پاخێل؛ یه‌کـه‌ی ژمـاردنی تـۆپ ٢. *[قـدیمی]* ئاره‌وانـه؛ عه‌ره‌بانـه؛ عاره‌بانـه؛ گوهێزۆک؛ که‌ره‌سته‌ی گواستنه‌وه‌ی چه‌رخ‌دار.

⊡ **عـراده‌ی کسـی چرخیـدن/ گشـتن:** چـۆپی ده‌ستی که‌سێ سووڕان؛ بژیوی که‌سێ بـاش بوون ‹کارش بد نیست و عراده‌اش می‌چرخد: کـاری خراپ نیه و چۆپی ده‌ستی ده‌سووڕێ›.

**عـرایض / arāyez'** ، ـهـا/: [عربـی] ١. جمـعِ ☜ **عریضه** ٢. جمعِ ☜ **عَرض**

**عرب / arab'** ، ـها؛ اعـراب/: [عربـی]/*اسـم.* عـه‌ره‌ب؛ عاره‌ب؛ عه‌ره‌و؛ عاره‌و؛ تاتکی؛ تات: ١. هـۆزێکی گه‌وره‌ی سپی پێسـتی سـامی، لـه دانیشـتوانی ڕۆژهه‌لاتی ناوه‌ڕاست ٢. هه‌ر یه‌که لـه که‌سـانی ئه‌و هۆزه.

⊡ **به هیچ عرب و عجمـی بنـد نبـودن:** *[مجـازی]* ده‌س لـه ئاسمـان و زه‌وی بـڕیان؛ ده‌س بـه هیچ به‌نه‌ی خوایه‌که‌وه به‌ن نـه‌بوون؛ ده‌سـت به هـیچ لایـه‌ک نه‌گه‌یشتن؛ نـه‌بوونی هـیچ پشت و په‌نایه‌ک ‹دستم به هیچ عرب و عجمی بند نیست: ده‌ستم له ئاسمان و زه‌وی براوه›.

**عربـده / arbade'** ، ـهـا/: [عربـی]/*اسـم.* گـوڕه؛ گوڕه‌گوڕ؛ گوڕمژ؛ هه‌لاـ هـه‌لا؛ هـه‌لا؛ نه‌ڕه‌نـه‌ڕ؛ حه‌را و حوول؛ هه‌را و هوو؛ قـاڵ‌وقـوو؛ قیڕه‌قیـڕ؛ نیڕه‌نێڕ؛ نیره‌نیڕ؛ گاڵ و بوخڕ؛ قاڵ و واڵ؛ حـه‌یچ و لوور؛ گاڵه‌گاڵ؛ ده‌نگ هه‌ڵێنانی شه‌ڕخوازانه به مه‌به‌ستی هه‌ڵگیرساندنی شه‌ڕ و داوا.

⊡ **عربـــده کشـــیدن:** نه‌ڕانـــدن؛ گوڕانـــدن؛ قیڕانـــدن؛ نه‌ڕه‌نـــه‌ڕکردن؛ گـــاڵ و بوخـــڕ کـــردن؛ قیڕه‌قیـــڕ کـــردن؛ عـــڕین؛ گاڵانـــدن ‹مسـت کـرده بـود و عربـده مـی‌کشـید: مه‌سـتی کردبوو، ده‌ینه‌ڕاند›.

**عربـده‌جـویی / arbadecûyî'/':** [عربـی/ فارسـی] *اسم.* شه‌ڕلاتی؛ شـه‌لاتی؛ مـزاوری؛ کـار و ڕه‌وتی نه‌ڕانـدن و قرمـه‌قرم کـردن بـه مه‌به‌سـتی شلـه‌ژاندن و هه‌ڵگیرسـاندنی شـه‌ڕ ‹با تهدید و عربده‌جویی مغازه‌داران را تلکه می‌کرد: بـه هه‌ڕه‌شـه و شه‌ڕلاتی دووکانداره‌کانی ته‌ڵه‌که ده‌کرد›. هه‌روه‌ها:

**عربده‌جو**

**عربده کشی** / 'arbadekešî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* نەڕ و نـۆڕ؛ قیـڕ و واڕ؛ قـاڵ و قـوو؛ گـاڵ و واڵ؛ مەراحوون؛ کار و ڕەوتی قیڕاندن ‹هر شب توی خیابانها به عربده‌کشی می‌پرداختند: هەموو شەوێ لە ناو شەقامانـدا خەریکی نەڕ و نور بوون›.

**عربی**[1] / 'arabî/: [عربی]/*اسم.* عـەرەبی؛ عـارەبی: ۱. لە زمانەکانی سـامی کـە خەڵـکێکی زۆر لـە ولاتانی ڕۆژهەڵاتی نزیـک و ئافریقـای بـاکووری قسەی پێ دەکەن ۲. ڕەگەزێک لە ئەسپ.

**عربی**[2]: *صفت.* عەرەبی؛ عارەبی؛ عـارەوی؛ سـەر بە عەرەب ‹رقص عربی: هەڵپەڕکێ عەرەبی›.

**عـرش** / 'arš/: [عربـی]/*اسـم. [ادبـی]* تەشـق؛ کەشکەڵان؛ عـەرش؛ قـوڕش؛ ئـەخش؛ بـەرزایی ئاسمان.

▣ **عرش اعلی:** سـاپیتە/ کەوکـەوە/ کەوکەوانـە/ کۆرەکـۆرەی ئاسمـان؛ تەشـقی عاسمـان؛ کەشـکەڵانی فەلـەک؛ بـەرزترین شـوێنی ئاسمان.

◘ **عرش را سیر کردن:** *[مجازی]* پـێ لـە زەوی نەکەوتن؛ گەزگەز بالاکردن؛ دنیا وە/ لـە خـۆ گرتن؛ زۆر دڵخۆش و شـادمان بـوون؛ زۆر بـە کەیف بوون؛ یەکجار گەش بـوون ‹آن شب از خوشحالی عرش را سیر می‌کرد: ئـەو شـەوە لـە خۆشیان پێی لە زەوی نەدەکەوت›.

**بـه عـرش رسـاندن:** *[مجازی]* سـەر گەیاندنـە ئاسمان؛ گەیاندنە کۆرکـۆرەی ئاسمـان؛ سـەر بردنە ئاسمانی حەفتـەمین؛ سـەر بردنـە بـان هەور؛ لە زەوی هەڵبڕین؛ زۆر تـاریف‌کـردن و پێدا هەڵگوتن ‹آن‌قدر گفت کـه او را بـه عـرش رساند: ئەوندەی گوت سەری گەیاندە ئاسمان›.

**عرشـه** / 'arše/: [عربـی]/*اسـم.* عەرشـە؛ جێگـەی ڕووباز و تەخت و پانی سەر کەشتی.

**عرصـات** / 'arasāt/: [عربـی]/*اسـم.* ۱. جمعِ ☜ **عرصه** ۲. سـارای مەحشـەر؛ دەشـتی مەحشـەر

۳. *[مجـازی]* هەزارەزیلە؛ شوێنی زۆر قەرەباڵـغ و زیاتر بێ‌سەرەوبەرە و بە مەترسی.

**عرصه** / 'arse/، ـها؛ عَرَصات *[نامتداول]*/: [عربی]/*اسم.* گۆڕەپان؛ گـۆڕ؛ کـۆرژ؛ نـاوان؛ مەیـدان؛ مـەیان؛ بەرفراوانی ‹عرصه‌ی جنگ: گۆڕەپانـی شەڕ›.

◘ **عرصه به کسی تنگ شـدن:** *[مجازی]* سـەری هەموو کێوان لە کەسێک هاتنەیەک؛ دنیا لـە کەسێک بوون بە چەرمی چۆلەکـە؛ دەرەتـان لە کەسێک بڕان/ بەسیان؛ تـەنگ لـە کەسـێ هەڵـچنیان؛ زیـپ/ ڕیـپ بـۆ کەسـێ هـاتن؛ قەتیس مان؛ بە هۆی کۆسپ یـان ئاسـتەنگێ هەستی داماوی‌کردن ‹وقتی عرصـه بـه او تنـگ شد، کارخانـه را فروخـت: کاتـێ دەرەتـانی لـێ بـڕا کارخانەکەی فرۆشت›.

**عرصـه را بـه کسـی تنـگ کـردن:** *[مجـازی]* تەنگ/ پشـوو لـە کەسـێ هەڵـچنین؛ گـۆڕی کەسـێ هێنانـە گۆڕخانـە؛ دەرەتـان لـە کەسـێ بـڕین؛ لـوانی ژیـان یـان چـالاکی دڵـخواز لـە کەسـێ گـرتن ‹بیمـاری مـادرش عرصه را بـه او تنـگ کـرده بـود: نەخۆشـی دایکـی تەنگی پـێ هەڵـچنیبوو›. هـەروەها: **عرصـه را تنگ دیدن**

**بـه عرصـه رسـیدن:** *[مجـازی]* دەس بـە دەم گەیشتن؛ دەس ترێشتە گرتن؛ باڵەوازە بوون؛ پـەڕەوازە بـوون؛ لـە ئـاو دەرهـاتن؛ بـە نـانێ گەیشتن؛ پێ‌گەیشتن و پوختە بوون ‹بچه‌هایم دیگر به عرصه رسیده‌انـد و رفتـه‌انـد دنبـال زنـدگی خودشان: منداڵـەکانم ئیتـر دەسـیان بـە دەمیـان دەگا و چوونەتە دیار ژیانی خۆیـان›. هـەروەها: **به عرصه رساندن**

**عرض** / 'araz/، ـها؛ أعراض/: [عربی]/*اسم.* ۱. *[منطق]* عەرەز؛ ئەوەی کە هەبوونی بە شـتێکی دیکـەوە بەسـراوە (وەکـوو ڕەشـی، گـەرمی، درێـژی) ۲. *[نامتـداول]* ڕووداو؛ کارەسات؛ پێشهات؛ ئەوەی کـە لـە شـتێکدا ڕووی دابـێ یـان بـە سـەریدا

داسەپایێ.

**عرض** / arz'/: [عربی]/سم. ١. ـها/ بەر؛ وەر؛ وەری؛ پانایی؛ پانتایی؛ پاناتی؛ پێنایی؛ پەهنایی؛ بەرینایی؛ بەرینی؛ هەرایی؛ رادە و ئەندازەی بارست ‹عرض قالی؛ عرض اتاق: بەری قالی؛ پانایی دیو› ٢. کار یان رەوتی رانان؛ نواندن؛ ناساندن ٣. کار و رەوتی گوتن؛ وتن؛ واتەی؛ راگەیاندن ‹خدمتشان عرض کردم که اطلاع ندارم: پێیانم گوت که ئاگام لێ نیە› ٤. ماوە؛ مەودا؛ کات ‹در عرض یک هفته کارش را تمام کرد: لە ماوەی حەوتوویێکدا کارەکەی تەواو کرد› ٥. ـها؛ عرایض/ قسە؛ قسیە؛ گوتە؛ وتە؛ پەیڤ؛ عەرز ‹عرض بنده این است که...: قسەی من ئەمەیە کە...›.

▣ **عرض اندام**: خۆنوێنی؛ کاری خۆ نواندن؛ خۆ رانان؛ خۆ وەدەرخستن: **عرض وجود**

**عرض جغرافیایی**: پانی/ بەری جوگرافیایی؛ مەودای شوێنێکی لە سەر گۆی زەوی تا هێڵی ئوستوا.

**عرض حال**: سکالانامە.

**عرض وجود** ☜ **عرض اندام**

▣ **عرض کردن**: وتن؛ گوتن؛ بە عەرزگەیاندن: **به عرض رساندن**

**به عرض رساندن** ☜ **عرض کردن**

**عرض** / erz'، ـها؛ أعراض [نامتداول]/: [عربی]/سم. [ادبی] ئاوروو؛ ئاڤروو؛ ئابروو؛ ئابوور.

▣ **عرض خود را بردن**: ئابرووی خۆ بردن؛ خۆ بێئابرووکردن؛ ئاورووی خۆ تکاندن؛ رووی خۆ دادرین؛ حەیای خۆ بردن؛ رووی خۆ هەڵمالین؛ ناو خۆ زڕاندن ‹عِرض خود می‌بری و زحمت ما می‌داری: ئابرووی خۆت دەبەی، ئێمەش تووش دەکەی›.

**عرضاً** / arzan'/: [عربی]/قید. لە/ بە پاناوە؛ لە پانیدا؛ پانەیوە؛ لە هەراییەوە؛ بە باری پانایی‌دا ‹عرضاً برش داده شده است: لە پاناوە براوە›.

**عرضه** / arze'/: [عربی]/سم. ١. کار یان رەوتی نواندن؛ رانان؛ نیشاندان؛ بەتایبەت نواندنی شتێک بۆ راکێشانی داواکاری و دۆزینەوەی خوازیار. هەروەها: **عرضه داشتن؛ عرضه کردن** ٢. [اقتصاد] کار یا رەوتی پیشاندان؛ لە بەر چاو دانان بۆ فرۆتن. بەرانبەر: **تقاضا**

**عرضه** / orze'/: [عربی]/سم. لێهاتوویی: ١. کارایی؛ کارامەیی ‹باید عرضه داشته باشی مغازه را خوب اداره کنی: دەبێ لێهاتوویت هەبێ دووکانەکە چاک بگەرێنی› ٢. توانست؛ توانایی؛ تانست؛ زەرف ‹او عرضه این کار را نداشت: ئەو توانستی ئەم کارەی نەبوو›.

**عرضی** / arazî'/: [عربی] صفت. رووداو؛ دەرکەوتوو؛ تووش‌هاتوو.

**عرضی**[1] / arzî'/: [عربی] صفت. پانی؛ پانایی؛ بەر؛ لایەنی سەر بە پانایی ‹برش عرضی؛ خطهای عرضی: برشی پانی؛ هێڵی پانایی›.

**عرضی**[2]: قید. لە پاناوە؛ لە پانیەوە؛ لە باری پانیەوە ‹آن را عرضی برید: ئەوەی لە پاناوە بڕی›.

**عرعر**[1] / ar.'ar'، ـها/: [عربی]/سم. هەورس؛ هەوریس؛ هەورێس؛ هەڤریس؛ هەڤریسک؛ هاڤرسک؛ هەوێس؛ ئیرڤست؛ هێرڤست؛ عەرعەر؛ وەهل؛ ئەرز؛ مەرخ؛ دارێکی بەرزە لە تیرەی سماق بە گەلای پان، گوڵی تەکووز و جەوگی بۆگەنەوە، چێوەکەی لە دارتاشیدا بە کەڵک دێ.

▣ **عرعر چینی**: دارپیو؛ جۆرە درەختێکە رۆنێکی روەکی لێ دەگرن، بۆ خواردن دەبێ.

**عرعر سوری**: هەڤریسکی ناوکی؛ جۆرێ درەختی هەڤریسکی جوان و گەلاپانە کە زۆر بەرز دەبێ.

**عرعر**[2]: صوت. زەرەزەر؛ سەرەسەر؛ هەرەهەر؛ زارزر؛ زرازر؛ زرەزر؛ زەرە؛ زەر؛ سەرە؛ دەنگی بەرزی گوێرێژ.

▣ **عرعر کردن** ☜ عر زدن، **عر**

**عرف** / orf'، ـها/: [عربی]/سم. داب و نەریت؛ باو؛

گەلەمپـەر؛ هۆرتـە؛ دام؛ ڕێـس؛ ڕێسـا: ١. کردەوەیـێ کـە کۆمەڵـگا پەسـندی کـردووە و زۆربەی کۆمەڵ گۆچی بووگن ‹نباید خارج از عـرف رفتار کنی: نابێ بەدەر لە داب و نـەریت بجووڵـیەوە› ٢. ئاکـاری لـە ڕووی دابونـەریتی ئاسـایی خەڵکەوە (نە بە پێی ئایین یان قانوونی نووسراو).

**عرفا / orafā'/**: [عربی] جمعِ ☜ **عارف**

**عرفاً / orfan'/**: [عربی] *قید.* بـە داب و دەسـتوور؛ بـەباو؛ بـە داب و نـەریت؛ بـە پێـی ئـەوەی لـە کۆمەڵگادا باوە ‹عرفاً این کار پذیرفته نیست: بـە داب و دەستوور ئەم کارە ناپەسندە›.

**عرفان / erfān'/**: [عربی] *اسم.* عیرفـان؛ بـڕوا بـە دۆزینـەوەی ڕاز و نهـێنی دنیـا و ڕاسـت و ڕەوا بوونی بناغەی جەهان بە بیرکردنەوە و ڕامـان و تێهەڵچوونی ڕۆح (نـە لـە ڕێـی تـاقیکردنـەوە و بەڵگەی زانستیەوە).

**عرفـانی / erfānî'/**: [عربـی] *صـفت.* عیرفـانی؛ عاریفانە؛ سەر بە عیرفان ‹شعر عرفـانی: هـۆنراوەی عیرفانی›.

**عرفه / arafe'/**: [عربـی] *اسـم.* عەرەفـە: ١. ڕۆژی پـێش جێـژنی قوربـان؛ ڕۆژی نۆیـەمی مـانگی زیحەجە ٢. *[گفتاری]* ڕۆژی پێش جێژن.

**عرفی / orfî'/**: [عربی] *صفت.* ١. باو؛ گەلەمپەری؛ ڕێسـایی ‹قواعـد عرفـی: بنەماگـەلی بـاو› ٢. غەیرەدینی؛ جگـە دینـی؛ نـادینی ‹حکومـت عرفی: حکوومەتی نادینی›.

**عرق / araq'/**: [عربی] *اسم.* ئارەق؛ عارەق؛ ئەرەخ؛ ئارەقە: ١. *[فیزیولوژی]* لیزک؛ خۆهـ ؛ خـێ؛ خـۆ؛ خوویە؛ تراوێکـی زەلاڵ و سـوێر کـە لـە لـووی ئارەقڕێژی نێو پێستی گوانداراتـەوە دەدەڵـێ و لە ئاو و چەنـد مـاکی کـانی و ئـالی پێکهـاتووە ‹عـرق بـدن: عـارەقی لـەش› ٢. خواردنـەوەی ئەلکولی کە لە ترشاندن و تنۆکاندنی ئاوی میوە بەتایبەت ترێ بەرهەم دێ ‹عرق کشمش: عارەقی کشمیش› ٣. تراوێ کە لە تنۆکاندنی کولاتـووی گـژ و گیـا بەرهـەم دێ ‹عـرق بیدمشـک: عـارقی بیمشـک› ٤. *[مجـازی]* بـۆق؛ هەڵـم ‹عـرق کـردن شیشە: بۆق کردنی شیشە›.

▣ **عرق سگی:** *[مجـازی]* ئـارەق دەسـی؛ عـارەق سەگی؛ ئارەقی تیژ و تون، بە ڕێژەیەکی زۆری ئەلکولەوە.

▣ **عرق ریختن:** عارەق ڕشـتن؛ ئـارەق ڕژانـدن/ تکاندن؛ هارەق متەی: ١. خۆ دان؛ خوهـ دان ‹همین‌طور داشتم شرشر عرق می‌ریختم: هـەروا لـە بەریکەوە چۆڕەـچۆڕ عارەقم دەڕشت› ٢. *[کنایی]* بە هـەموو هێـزەوە کـارکردن؛ زۆر زەحمـەت کێشان ‹من سالها روی زمین عـرق ریختـه‌ام: مـن چەنایچەن سـاڵ لـە سـەر ئـەم زەوینـە ئـارەقم ڕژاندووە›.

**عـرق کـردن:** ئـارەقکـردن؛ ئـەرەق دەردان؛ هارەقکەردەی؛ نەقتاندن؛ خۆ دان؛ خوه دان؛ خوەه دان؛ دەرکـەوتنی دڵـۆپەی عـارەق لـە سەر شتێ.

**عـرق کسـی را درآوردن:** *[کنـایی]* ١. نـاوکی کەسێ گرتنەوە؛ زۆر بۆ کەسێک هێنان؛ گیان هێنانە نووک لووت کەسێ؛ زووخاو بە کەسـێ هەڵـهێنان؛ خـوێن و ئـاوی کەسـێک کردنـە یەک؛ کەسێ بە کاری گران ناچارکردن ‹این کولر تا درست شد عرق مرا درآورد: تا ئـەم کـوولێرە دروست بوو ناوکمی گرتەوە› ٢. *[مجازی]* ئـارەق بە کەسـێ دەردان؛ کەسـێ شـەرمەزارکردن؛ تەریقەوکردن ‹بس که پذیرایی و محبت کرد، عرق ما را درآورد: ئەوندە میوانداری کـرد، عـارەقی پـێ دەرداین›.

**عـرق کشـیدن:** ئـارەقگـرتن؛ تنۆکانـدنی کولاتووی گژ و گیا (وەک نەعنا) یـان میـوە و دەنکی ترشاو (وەک ترێ، سێو، برنج) و بەرهەم هێنانی ئارەقیان.

**عـرق / erq'**، عـروق/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* ڕەگ؛ ڕەک؛ ڕەه ؛ ڕەو؛ ڕا؛ ڕێ؛ دەمار.

**عرق‌النسا** / erqonnesā'/: [عربی]/اسم. [کالبدشناسی]
☜ عصب سیاتیک، **عصب**

**عـرق‌جـوش** / araqcûš'/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. ئاگره؛ ئاوره؛ ئاگرۆک؛ گرمژنه؛ گرمژه؛ جوانـه‌ژۆ؛ جوانـه‌زۆ؛ جوانـه‌زرۆ؛ جوانـه‌زوه؛ جوانـه‌زه‌وه؛ جوانکه؛ زووه؛ جوانه‌زمه؛ زه‌ک و جوانی؛ عازه‌به؛ سـنگه‌ک؛ سـنگک؛ جۆرێـک ورده بلـۆقی سـه‌ر پێسته که هه‌وا و ئالۆشی زۆره و پتـر بـه هـۆی عـاره‌ق و تـاوی ڕۆژ لـه کـوڕی جحێڵـدا ده‌رده‌که‌وێ.

**عرقچین** / araqčîn'، ـها/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. ئـاره‌قچن؛ ته‌قلـه؛ ته‌قیلـه؛ تاقیلـه؛ ئـاره‌قچین؛ عه‌ڕه‌خشه؛ جۆرێ کلاوی بێ‌شه‌پکه‌ی نیوه‌گۆ له جنسی پارچه یان چنراوه.

**عرقخور** / araqxor'، ـها/: [عربـی/ فارسـی] صفت. ئـاره‌قی؛ ئـاره‌قخۆر؛ مـه‌ی‌ڤـه‌خۆر؛ هـاره‌قوه‌ر؛ فێره‌خواردنه‌وه‌ی ئه‌لکول.

**عرقخوری** / araqxorî'، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئـاره‌قخۆری؛ مـه‌یخۆری؛ کـاری خواردنـه‌وه‌ی خواردنه‌وه‌گـه‌لی ئـه‌لکولی ‹پـس از آن افتـاد بـه عرقخوری و روز بـه روز حـالش بـدتر شـد: پـاش ئـه‌وه پلیکـا بـه ئاره‌قخۆریـه‌وه و ڕۆژ لـه دووی ڕۆژ حالـی خراپتر بوو›.

**عـرق‌سـوز** / araqsûz'/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. گه‌رماژنـــه‌ک؛ گه‌رماوژنـــه‌ک؛ گه‌رمایژنـــه‌ک؛ عه‌ره‌ق‌سووز؛ چه‌شنێ سـووتانه‌وه‌ی پێسـت بـه ئـاره‌قی لـه‌ش کـه ده‌بێتـه هـۆی ده‌رهـاتنی ورده‌زیپکه‌ی سوور له سه‌ر پێسـته‌وه و پتـر لـه ناوگه‌ڵ، بنباڵ و ژێر ملی منداڵانـدا بـه‌دی دێ. هه‌روه‌ها: **عرق‌سوز شدن؛ عرق‌سوز کردن**

**عرق‌فروشی** / araqfurûšî'، ـها/: [عربی/ فارسـی] /اسم. ئاره‌ق‌فرۆشی؛ هاره‌ق‌وره‌شـی: ۱. مه‌یخانـه؛ فرۆشـگای خواردنـه‌وه‌ی ئـه‌لکولی ۲. کـاری فرۆشتنی عاره‌ق ‹از عرق‌فروشی معاش زنـدگی‌اش را تأمین می‌کند: به ئاره‌ق‌فرۆشی بژیـوی ژیـانی دابـین ده‌کرد›. هه‌روه‌ها: **عرق‌فروش**

**عـرق‌کشـی** / araqkešî'/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. ئـاره‌ق‌گـیری؛ عـاره‌ق‌گـری: ۱. کـار یـا ڕه‌وتی عاره‌ق‌گرتن ۲. کارگای عاره‌ق‌گیری * **عرق‌گیری**

**عرق‌گز** / araqgaz'/: [عربی/ فارسی]/اسم. زیرکـه؛ زیپـک؛ شـینۆک؛ تشـپۆ؛ تشـپۆک؛ تشـپۆکه؛ پیرۆسـکه؛ بلـۆقێکی سـپی کـه بـه هـۆی کـۆ بوونه‌وه‌ی ئاره‌ق له ژێر پێستدا به‌دی‌دێت.

**عرقگیر** / araqgîr'، ـها/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. ئاره‌قگیر: ۱. ژێرکراس؛ ژێرکراسـی؛ ژێرشـه‌وی؛ بلووزێکی هه‌راو و بێ یه‌خه که له ژێر جله‌وه لـه به‌ری ده‌که‌ن ۲. نه‌رمه‌زین؛ بن‌زین.

**عـرق‌گیـری** / araqgîrî'/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **عرق‌کشی**

**عرقه** / arqe'/: [؟] ☜ **ارقه**

**عرقیات** / araqîyyāt'/: [عربی]/اسم. ئاره‌قه‌مـه‌نی؛ عاره‌قی جۆراوجۆر.

**عر و تیـز** / arr-o-tîz'/: /اسم. [تعـریض، مسـتهجن] ۱. نـه‌ڕ و نـوور؛ نه‌ڕه‌نـه‌ڕ؛ قـرموقـاڵ؛ قـرمقـاڵ؛ قاڵه‌قاڵ؛ قیڕه‌قیڕ؛ گاڵه‌گاڵ؛ قاڕ و واڕ؛ قاڕ و قـوو؛ قاڵ و قوو؛ قیر و واڕ؛ قیـژ و واژ؛ حـه‌یچ و لـوور؛ حه‌چ و لـوور؛ گـاڵ و بوخـڕ؛ گوڕه‌گـوڕ؛ هـه‌را و گوڕه؛ سرسارِ؛ ده‌نگه‌ده‌نگ و قه‌پ و قاڵـی بێهـۆ ۲. هه‌ڵچوویی؛ په‌رفه‌ش؛ ڕووشی؛ شاخه؛ قسه‌ی تاڵ و ئاکاری دژبه‌رانه. هه‌روه‌ها: **عر و تیز کردن**

**عروج** / urûc, 'orûc'/: [عربی]/اسم. [ادبی] ڕه‌وتی بـه‌رزه‌وه بـوون؛ بـه‌رز بوونـه‌وه؛ سـه‌رکه‌وتن؛ هه‌ڵکشان: ۱. بۆ جێگایه‌کی به‌رزتر و بایه‌خدارتر چوون ‹عروج به آسمان: به‌رزه‌وه بوون بـۆ ئاسمـان› ۲. به‌ره‌و پێشکه‌وتن و سه‌رتری چوون.

**عـروس** / arûs'/: [عربـی]/اسـم. بـووک؛ بیـک؛ بوویک؛ بویک؛ به‌و؛ بوه‌وی؛ وه‌هی؛ وه‌وی؛ وه‌یوه؛ وه‌یوو؛ ڤه‌یڤی؛ ڤه‌یه‌ک؛ ڤیک: ۱. /ـها/ ژنی تـازه شوو ‹سارا هم عـروس شـد: سـارایش بـووه بـووک› ۲. /ـها/ په‌یوه‌ندی ژن له‌گه‌ڵ بنه‌ماڵه‌ی مێردیدا

‹این خانم عروس ماست: ئەم خاتوونە بووکی ئێمەیە› ٣. *[مجازی]* هەر شتێکی زۆر جوان، ڕازاوە و شکۆمەند ‹دهوک عروس شهرهای کردستان است: دهۆک بووکی شارانی کوردستانە›.

▣ **عروس شدن:** شووکردن؛ مێردکردن؛ بوونە بووک؛ بیەی وەیوە.

**عروس کردن:** بە شوو دان؛ دانە شوو؛ بە مێرد دان؛ کچ کردنە بووک ‹دخترش را پارسال عروس کرد و پسرش را هم امسال داماد: کچەکەی پارەکە بە شوو دا و ئەمسالیش بۆ کوڕەکەی ژنی هێنا›.

**عروس‌دریایی** / arûsedaryāî' ، عروسهای دریایی؛ عروسان دریایی/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* بووکی زەریا؛ کیژەدەریایی؛ گیانەوەرێکی چەترئاسای بێئێسقانی دەریاژیە.

**عروسک** / arûsak' ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ١. بووکەڵە؛ بووکیلە؛ بوکلە؛ بەولکان؛ بەبۆکە؛ بووکەشووشە؛ بووکەسەماکەرە؛ بەبۆڵە؛ بەبلانە؛ کووکلە؛ وەویلە؛ وەویلکە؛ وەویە؛ وەیولێ؛ وەیووڵە؛ تەتە؛ تەتەبەخێ؛ بیبی؛ خلنزەر؛ بیچبیچەخانم؛ بویکابچویک؛ جۆرێ لەیستۆک لە شێوەی مرۆ یان گیانەوەری بچووک ٢. *[مجازی]* بووکە؛ شاجوان؛ کچ یان ژنێ زۆر جوان و لەبار.

▣ **عروسک پس پرده** ☜ **کاکنَج**

**عروسک خیمه‌شب‌بازی:** بوتەکێ؛ بووکە سەماکەرە: ١. بووکەشانۆ؛ لەیزتۆکالقەک؛ بووکەڵەی نمایشی بیبیجان ٢. *[مجازی]* گوێلەمست؛ گوێڕایەڵ؛ بێدەسەلات و گوێ لە مستی دیتران ‹دولتمردانشان شده بودند عروسک خیمه‌شب‌بازی قدرتهای بزرگ: سەرانیان ببوونە بووکەسەماکەرەی زلهێزان›.

**عروسک‌بازی** / arûsakbāzî'/: [عربی/ فارسی] /*اسم.* بووکێن؛ بووکبووکێنە؛ بیکانێ؛ بووکەڵەبازی؛ وەویلەبازی؛ وەویلکەبازی؛ کاری کایەکردن بە بووکیلە ‹بچەها در گوشەی اتاق داشتند عروسک‌بازی می‌کردند: منداڵەکان لە سووچێکی دیوەکەدا بووکێنیان دەکرد›.

**عروسک‌گردان** / arûsakgardān' ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* بووکەڵەگەڕێن؛ وەویلکەگەڕێن؛ ئەوی لە شانۆی بووکیلەییدا، بووکیلەکان دەخاتە کایەوە. هەروەها: **عروسک‌گردانی**

**عروسی** / arûsî' ، ـها/: [عربی]/*اسم.* زەماوەن؛ زەماوەند؛ زەماوەنە؛ سوور؛ هەڤالا: ١. شادیانە؛ داوەت؛ دۆوات؛ دەوەت؛ توۆی؛ شاهی؛ شایی؛ بەزم؛ ڕێوڕەسمێ کە بە بۆنەی زەماوەندی ژن و پیاوێک بەڕێوە دەچێ و وێڕای بەزم و هەڵپەڕکێیە ‹در کوچەی ما عروسی بود: لە کۆڵانی ئێمە زەماوەن بوو› ٢. پەیمانی ژن و مێردایەتی ‹آزاد با دختر حاج حسن عروسی کرد: ئازاد لەگەڵ کچەکەی حاجی حەسەن زەماوەندی کرد› ٣. جەژن؛ جێژن؛ گۆوەند؛ گۆبەند؛ شایی و خۆشی ‹مرگِ خر است و عروسی سگ: تۆپینی کەرە و جەژنی سەگ›.

▣ **عروسی بودن:** زەماوەند بوون؛ زەماوەن بیەی؛ بەرپا بوونی زەماوەن؛ بەڕێوە چوونی ڕێوڕەسمی زەماوەن.

**عروسی کردن:** زەماوەند/ زەماوەن‌کردن؛ زەماوەن‌کەردەی؛ شایی‌کردن؛ ژن هێنان یا شووکردن.

**عروسی گرفتن:** زەماوەند/ داوەتی/ شایی/ زەماوەن‌گرتن؛ زەماوەن‌گێڕان؛ شایی‌گێڕان؛ ئاهەنگێک کە بە بۆنەی زەماوەندەوە دەگیرێت ‹برایشان عروسی مفصلی گرفت: زەماوەندێکی قورسی بۆیان گرت›.

**عروض** / arûz'/: [عربی]/*اسم.* عەرووز؛ تەرازووی هەڵبەست؛ بنەمای کێشی شیعر لە شیعری کۆنی وڵاتانی ئیسلامیدا.

**عروضی** / arûzî'/: [عربی]/*اسم.* عەرووزی؛

پێوەندیدار یان سەر بە عەرووزەوە ‹شعر عروضی؛ وزن عروضی: هەڵبەستی عەرووزی؛ کێشی عەرووزی›.

**عروق** / 'urûq, 'orûq/: [عربی] جمعِ ☜ **عِرق**

**عروقی** / 'urûqî, 'orûqî/: [عربی]/اسم. ڕەگی؛ دەماری؛ سەر بە ڕەگ ‹بیماری عروقی: نەخۆشینی ڕەگی›.

**عریان** / 'oryān/: [عربی] *صفت.* ڕووت؛ پەتی: ١. زەلووت؛ زلووت؛ زووت؛ لوەت؛ لوت؛ لووت؛ زلیت؛ هیلاو؛ تازی؛ بووت؛ ڕووس؛ چیپ؛ ئاونیش؛ ڕاتڕیت؛ ڕووت و قووت؛ ڕووت و عەمەنە ‹دشت عریان: دەشتی ڕووت› ٢. *[مجازی]* ئاشکرا؛ روون؛ بێهیچ پەردە و لێڵیەک ‹حقیقت عریان: ڕاستی ئاشکرا›. هەروەها: **عریان بودن؛ عریان شدن؛ عریان کردن**

**عریانی** / 'oryānî، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ڕووتی؛ هیلاوی؛ زەلووتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕووت بوون.

**عریض** / 'arîz/: [عربی] *صفت.* پان؛ هەراو؛ ولە؛ بەرپان؛ پۆڕ؛ پەهن؛ بەرین؛ پێن؛ پەحن ‹کوچەی عریض: کۆلانی پان›.

**عریض و طویل** / 'arîz-o-tavîl/: [عربی] *صفت.* *[گفتاری]* ١. پان و بەرین؛ بەربلاو؛ درێژ و پان؛ پان و درێژ ‹حیاط عریض و طویل: حەوشەی پان و بەرین› ٢. دوور و درێژ؛ پان و پۆڕ ‹نامەی عریض و طویل: نامەی دوور و درێژ›.

**عریضه** / 'arîze، ـها؛ ـجات؛ عرایض/: [عربی]/اسم. سکاڵانامە؛ دادنامە؛ داخوازنامە؛ نووسراوەیێ پتر بۆ پێگەیێکی ڕەسمی یان کەسایەتییەکی گەورە سەبارەت بە شکات یان داخوازێک.

**عریضەجات** / 'arîzecāt/: [عربی] جمعِ ☜ **عریضه**

**عریضەنویس** / 'arîzenevîs، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. سکاڵانووس؛ نامەنووس؛ دادنامەنووس؛ داخوازینامەنووس؛ ئەوی کە نامە (بەتایبەت سکاڵانامە یان نامەی داخوازی) بۆ خەڵک دەنووسێ و پارە وەردەگرێ.

**عریضەنویسی** / 'arîzenevîsî/: [عربی/ فارسی] /اسم. دادنامەنووسی؛ داخوازنووسی؛ سکاڵانڤیسی: ١. /ـها/ کار یان ڕەوتی نووسینی داخواز و سکاڵا ٢. پیشەی سکاڵانووس.

**عز** / 'ez(z)/: [عربی]/اسم. ١. بەڕێزی؛ ڕێزداری؛ هێژایی ٢.سەرفەرازی؛ سەربەرزی؛ سەربڵیندی.

◘ **عزّ وصول بخشیدن:** *[ادبی]* پێ خەلات بوون؛ بە دەست هێنانی شتێکی بەنرخ؛ لە کەسێکی گەورە شتێکی بایەخدار پێگەیشتن ‹نامەی جنابعالی دیروز عز وصول بخشید: نامەی بەڕێزتانم دوێنێ پی خەلات بوو›.

**عزا** / 'azā/: [عربی]/اسم. پرسە؛ سەرەخۆشی؛ ئازیەت؛ عازیەتی؛ ئازیەتی؛ ئەزا: ١. شین؛ شیوەن؛ وەشەت؛ پەژارەی گەورە کە بە هۆی تیاچوونی کەسێکی خۆشەویست بە سەر کەسێکدا دێ ‹عزا گرفتن: پرسەگرتن› ٢. /ـها/ *[مجازی]* شینگێڕی؛ تازیەباری؛ عازیەتباری؛ ئازیەتباری؛ تازیمانە ‹بە عزا نشستن: شینگێری کردن›.

◘ **عزا گرفتن:** ئازیەتیگرتن؛ تازیمانەگرتن؛ شینگێڕیکردن: ١. پرسەگرتن؛ شیوەن کردن/ گرتن ‹برایش یک هفته عزا گرفتند: حەوتوویەک پرسەیان بۆی گرت› ٢. *[کنایی]* زۆر نارەحەت بوون؛ پەرێشان بوون ‹عزا گرفتەام کە شهریەی مدرسەی بچەها را از کجا بیاورم: تازیەتیم گرتووە، پارەی قوتابخانەی منداڵان لە کوێ بێنم›.

**از عزا درآوردن:** پرسە شکاندن؛ لە شینگێڕی دەرهێنان؛ ئازیەتی پێبرینەوە ‹همسایەها جمع شدند و او را از عزا درآوردند: هاوسێکان کۆ بوونەوە و پرسەیان پی شکاند›. هەروەها: **از عزا درآمدن**

**بە عزای کسی نشستن:** پرسە بۆ کەسێک گرتن؛

بۆ کەسێ ڕەش پۆشان؛ تازیە/ عازیەتی/ شینگێڕی بۆ کەسێ گرتن؛ بە بۆنەی مەرگی کەسێکەوە پرسە و سەرەخۆشی دانان.

**کسی را به عزا نشاندن:** کوست کەسێ خستن؛ کەسێک ڕەشپۆش کردن؛ کەسێک ئازیەتبار کردن.

**عزاخانه** / azāxāne' ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پرسەخانە: ١. ئەو شوێنە ڕێوڕەسمی پرسەی تێدا بەڕێوە دەچێ ٢. شیوەنگا؛ شیوەنیا؛ خەمخانە؛ ئەو شوێنەی ئەبێتە هۆی خەم و خەفەت.

**عزادار** / azādār' ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. ئازیەتبار؛ پرسەبار؛ ئازیزمەردە؛ مریدار ‹این مصیبت را به خانوادەهای عزادار تسلیت می‌گوییم: ئەم کۆستە لە بنەماڵە ئازیەتبارەکان سەرەخۆشی دەکەین›. هەروەها: **عزادار بودن؛ عزادار شدن؛ عزادار کردن**

**عزاداری** / azādārî' ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پرسە؛ تازیە؛ ئازیەت؛ ئازیەتباری؛ شینگێڕی.

**عزب** / azab' ، ـها/: [عربی] صفت. سەڵت؛ ڕەبەن (بۆ پیاو)؛ عازەو؛ ئازەب؛ مانگوڕ (بۆ ژن)؛ زگورد؛ زوگورد؛ زوگورتی؛ قازاخ ‹مرد عزب: پیاوی سەڵت›.

**عزبخانه** / azabxāne' ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ڕەبەنخانە؛ ئەو شوێنە کە تەنیا پیاوانی بێژنی تێدا دەژین.

**عزبی** / azabî'/: [عربی]/اسم. سەڵتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەڵت بوون ‹آرام هم از عزبی درآمد: ئارامیش لە سەڵتی دەرهات›.

**عزت** / ezzat'/: [عربی]/اسم. ١. بەڕێزی؛ ڕێزداری؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەڕێز بوون ٢. سەرفەرازی؛ سەربەرزی؛ سەربڵیندی ٣. *[گفتاری]* کار و ڕەوتی ڕێز نان؛ ڕێزگرتن؛ خەمناندن.

▣ **عزت نفس:** بەرزەخۆیی؛ سەماخی؛ نەفس‌پێتی؛ بایەخ و حورمەتێ کە کەسێ لە ناو کۆمەڵگادا بۆ خۆی دایدەنێ و خۆی لە بێئاورِوویی و زەبوونی دەپارێزێ.

▣ **عزت گذاشتن:** ڕێز گرتن؛ ڕێز نان؛ خەمناندن؛ ڕێز دانان و بەرز ڕاگرتن ‹خیلی به ما عزت گذاشتند: زۆریان ڕێز لێ گرتین›.

**عزرائیل** / ezrā'îl'/: [عربی]/اسم. *[اسلام]* ئیزراییل؛ پێمێرد؛ گیانکەنکە؛ مەڵکەمووت؛ مەلکەلمەوت؛ گۆنگیر؛ پێشبرد؛ گیانبەر؛ گیانکێش؛ فریشتەی گیانکێشان.

**عزل** / azl'/: [عربی]/اسم. کار و ڕەوتی لابردن؛ ڕاقەتاندن؛ لە سەر کار هەڵگرتن؛ بەرکەردەی؛ دابڕین.

▣ **عزل شدن:** لابران؛ دەرکران؛ بەرکریەی؛ لابریای؛ لە سەر کار و پیشەی خۆ وەلا خران ‹عاقبت آقای وزیر هم عزل شد: ئاخری جەنابی وەزیریش لابرا›. هەروەها: **عزل کردن**

**عزلت** / ozlat' ، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ١. گۆشەنشینی؛ لاکەفتەیی؛ سڵکاندی؛ قەقەتاندی ٢. دوورەپەرێزی؛ گۆشەگیری.

▣ **عزلت گزیدن:** دوورەپەرێزی کردن؛ دوور گرتن؛ گۆشەگرتن.

**عزم** / azm'/: [عربی]/اسم. ١. نیاز؛ بڕیار؛ تەما؛ ئاهەنگ؛ بڕیارێ کە بۆ کردنی کارێ دەدرێ ٢. *[قدیمی]* زەبر؛ گەشتاوەر.

▣ **عزم داشتن:** لێبڕان؛ بڕیار دان؛ گەرەک بوون؛ بە تەمای کردنی کارێک بوون ‹عزم دارم هر طور شده آن مغازه را بخرم: لێبڕاوم هەر جۆرێ بووە ئەو دووکانە بکڕم›. هەروەها: **عزم کردن**

**عزوبت** / uzûbat, 'ozûbat'/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* سەڵتی؛ ڕەبەنی؛ بێهاوسەری؛ بێهاوژینی.

**عزیز** / azîz' ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. خۆشەویست؛ خوەشەویس؛ وەشەویس؛ ئازیز؛ ئەزیز؛ وەشەسیاو؛ دڵپەسن؛ لەبەردڵان؛ نازار؛ نوچەو؛ نووچەو.

**عزیزدردانه** / azîzdordāne' ، ـها/: [عربی/ فارسی]

صفت. نازار؛ منداڵی هەرە خۆشەویستی دایک و باب: **عزیزکرده**

**عزیزکرده** / azîzkarde'/: [عربی/ فارسی] ☜ **عزیزدردانه**

**عزیزمرده** / azîzmorde' ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. ئازیزمردوو؛ ئازیزمەردە؛ ئازیزمردە؛ عەزیزمردی؛ کۆس کەوتە؛ کۆست کەوتوو؛ کۆس کەفتی؛ دلڕیش؛ دڵبریندار؛ جەرگ سووتاو؛ خۆشەویست‌مردوو.

**عزیزی** / azîzî'/: [عربی]/اسم. خۆشەویستی؛ خوەشەویسی؛ وەشەویسی؛ ئازیزی؛ گشکەسی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لەبەردڵ و خۆشەویست بوون.

**عزیمت** / azîmat'/: [عربی]/اسم. ئاهەنگ؛ هەڵکۆچ؛ کار و ڕەوتی ڕۆیشتن؛ ڕۆشتن؛ کەوتنە ڕێ؛ ئەرەجمەی؛ داجمان؛ داجوین ‹قصد عزیمت به اربیل را داشت: ئاهەنگی ڕۆیشتن بۆ هەولێری کردبوو›.

▣ **عزیمت کردن**: ڕۆیشتن؛ ڕۆشتن؛ جمایرە؛ داجمان؛ داجوین؛ کەوتنە ڕێ لە شوێنێکەوە ‹دیروز از بانه عزیمت کردند: دوێنێ لە بانەوە ڕۆیشتن›.

**عسر** / osr'/: [عربی]/اسم. [ادبی] ١. ئاستەنگی؛ دژواری؛ گرانی؛ سەختی ٢. تەنگی؛ چەڵەمەیی ٣. دەستەنگی؛ داماوی؛ داماگی؛ دەرمەنەیی.

**عسرت** / osrat'/: [عربی]/اسم. [ادبی] چەرمەسەری؛ داماوی؛ داماگی؛ تەنگی؛ تەنگاتی؛ تەنگەوەری؛ ئەو چەڵەمە و سەخڵەتیانە کە لە بەر نەداری و دەستەنگی لە ژیاندا بە سەر کەسێکدا دێن.

**عسر و حرج** / osr-o-harac'/: [عربی]/اسم. [حقوق] دەستەنگی لە ماڵ گرتندا؛ لێنەهاتوویی بۆ گرتنی ماڵێکی‌تر.

**عسس** / asas'/: [عربی]/اسم. [قدیمی] شەوبان؛ شەوڤان؛ شەوپاسەوان؛ عەسعەس؛ حەسحەس؛ چەرخەچی؛ جەزایەرچی؛ جەزایرچی؛ نۆبەکار؛ گەزمە؛ ئێشکداری شەوانەی ناو شار.

▣ **عسس مرا بگیر کردن**: [کنایی] خۆ بە گیردان؛ مل خۆ دانە پەتەوە؛ بە ئانقەست یان نەزانکاری خۆ تووشیاری ئارێشەکردن.

**عسل** / asal'/: [عربی]/اسم. هەنگوین؛ هەنگوێن؛ هەنگووین؛ هەنجۆین؛ هەنوین؛ هەمگین؛ هەنگەمین؛ هەنگوون؛ هەنگڤ؛ هنگووڤ؛ هنگوڤ؛ هەنگڤ؛ هنگمێن؛ هنگڤین؛ هەنگین؛ هەسەڵ؛ کوتەفڕ؛ بەرهەمی شیلە و شیرینی مێشەنگوین، بریتی لە چەند جۆر قەند.

**عسلی**[1] / asalî'/: [عربی]/اسم. ١. /ـها/ عەسەلی؛ تەپلەک؛ مێزی نزم، بچووک و شیاوی ئەملاولا پێ‌کردن ٢. کارەبایی؛ هەنگوێنی؛ هەنگوینی؛ ڕەنگی قاوەیی ڕۆشن.

**عسلی**[2]: صفت. ١. هەنگوینی؛ هەنگوێنی؛ هەنوینی؛ هنگووڤی؛ هەنگیناوی؛ هەنگوین‌دار یان بە هەنگوینەوە تلاو ‹سوهان عسلی: سەوهانی هەنگوینی› ٢. کارەبایی؛ عەسەلی؛ بە ڕەنگی قاوەیی ڕۆشن ‹چشمهای عسلی قشنگی داشت: جووتێ چاوی کارەبایی جوانی هەبوو› ٣. دۆڵەما؛ دولەما؛ تەواو نەگرساو.

**عشا** / ešā'/: [عربی]/اسم. خەوتنان؛ شێوانگا؛ شێوان؛ عیشا.

▣ **نماز عشا** ☜ **نماز**

**عشاق** / oššāq'/: [عربی] جمعِ ☜ **عاشق**

**عشایر** / ašāyer'/: [عربی] جمعِ ☜ **عشیره**

**عشایری** / ašāyerî'/: [عربی] صفت. خێڵەکی؛ ڕەوەندی؛ کۆچەری؛ هۆزانی؛ خێلاتی؛ خێڵەساتی؛ کۆچەراتی؛ عێلاتی؛ عەشایەری؛ عەشرەتی؛ چووینی؛ سەر بە خێڵ و ڕەوەند ‹زندگی عشایری: ژیانی خێلەکی›.

**عشر** / ošr' ، ـها؛ اعشار/: [عربی]/اسم. دەیەک؛ یەک‌لەدە؛ وشر؛ لە دە پاژ پاژێک.

**عشرات** / ašarāt'/: [عربی]/اسم. دەیان؛ ڕیزی

دوای یه‌کان.

**عشرت** / 'ešrat/: [عربی]/اسم. خۆش‌بوێری؛ خوش‌گوزه‌رانی؛ ڕابوێری؛ وه‌شبه‌ری.

**عشرتکده** / 'ešratkade، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ڕابوێرگه؛ شوێنی ڕابواردن و خۆش‌گوزه‌رانی.

**عشریه** / 'ošrîyye/: [عربی]/اسم. ده‌یه‌کی؛ وشری؛ یه‌ک له ده‌ی پووڵ یان سامانێکی دیاریکراو.

**عشق** / 'ešq، ـها/: [عربی]/اسم. ١. ئه‌وین؛ ئه‌ڤین؛ هه‌ڤین؛ ڤیان؛ ڤین؛ خۆشه‌ویستی؛ خوه‌شه‌ویسی؛ وه‌شه‌سیای؛ دڵین؛ عه‌شق؛ ئێشق؛ مێهر و دڵبه‌سته‌یی سۆزدار به که‌سێ یان شتێک ‹عشق مادر؛ عشق به میهن: ئه‌وینی دایک؛ خوشه‌ویستی نیشتمان› ٢. گراوی؛ به‌نده‌واری؛ حه‌ز؛ واز؛ هه‌ز؛ هه‌ژ؛ دڵخوازی و ئۆگره‌تی زۆر هاورێ له‌گه‌ڵ پێدا هه‌ڵگوتن و خوازیار بووندا ‹عشق به کار؛ عشق به پول: حه‌ز به کار؛ واز له پاره› ٣. *[گفتاری]* که‌یف؛ خۆشی؛ وه‌شی؛ شادی ‹عشق کردن: که‌یف‌کردن›.

◙ **عشق افلاطونی:** عیشقی پاک؛ ئه‌وینی پاک؛ ئه‌وینێ که تێکه‌ڵ به نیازی جنسی نیه.

**به عشق چیزی/ کسی:** به خۆشی شتێ/ که‌سێ؛ به بۆنه یان له ڕێی شتێ/ که‌سێکدا ‹به عشق مادرم شب تا صبح کار می‌کردم: به خوشی دایکمه‌وه شه‌و تا به‌یانی کارم ده‌کرد›.

◘ **عشق بودن:** که‌یف بوون؛ خۆش بوون؛ خوه‌ش بوون ‹امروز عشق است: ئێمرۆ که‌یفه›.

**عشق داشتن:** *[گفتاری]* حه‌ز لێ‌بوون؛ گراوی بوون؛ خوازیار بوون؛ دڵحه‌ز بوون ‹خیلی به موسیقی عشق داشت: زۆر حه‌زی له مووسیقا بوو›.

**عشق کردن:** که‌یف‌کردن؛ خۆشی‌کردن؛ حه‌ز کردن.

**عشق کسی کشیدن:** حه‌زی که‌سێ هه‌ستان؛ مه‌یلی که‌سێ‌کێشان؛ گمێز که‌سێ که‌ف‌کردن ‹فردا اگر عشقش کشید و خواست برود، تکلیف ما چیست؟: سبه‌ینێ ئه‌گه‌ر حه‌زی هه‌ستا و ویستی بڕوا، چارمان چیه؟›.

**عشق ورزیدن:** دڵ شنیان؛ ئه‌ویندارانه خۆش ویستن ‹او به مادرش عشق می‌ورزید: دڵی بۆ دایکی ده‌شنیا›.

**عشقبازی** / 'ešqbāzî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ١. ئه‌وینداری؛ ئاکاری ئه‌ویندار بۆ نواندنی ئه‌وینه‌که‌ی ٢. *[مجازی]* پێوه‌ندی جنسی؛ هاوجێیی؛ نزیکی. هه‌روه‌ها: **عشقبازی کردن**

**عشق‌ورزی** / 'ešqvarzî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئه‌وینداری؛ کار یان ڕه‌وتی دڵ شنیان؛ خۆش ویستن و ئه‌ویندار بوون.

**عشقه** / 'ašaq(q)e/: [عربی]/اسم. مه‌شڵه‌زه‌رگۆ؛ گوڵه‌سپانه؛ گوڵه‌واژ؛ گوڵه‌سه‌رکێش؛ باداک؛ ئالینک؛ ده‌وه‌نێکی ڕازێنه‌یی که به دار و گیادا پێچ ده‌خوا و هه‌ڵده‌کشێ.

◙ **عشقه داردوست:** لاڤلاڤک؛ له‌ولاوه؛ لێلافک؛ لاولاوه سه‌رکێش؛ له‌ولاوه دیواری؛ گیایه‌که سوور یان شین ده‌کا، به دار و گیاوه ده‌ئاڵێ، به ده‌ور و نێوانیاندا ده‌پشکوێ و زوو ده‌پووچێته‌وه.

**عشقی** / 'ešqî/: [عربی] صفت. ١. ئه‌وینداری؛ ئه‌ویندارانه؛ عاشقانه؛ ئه‌ڤینداری ‹فیلم عشقی: فیلمی ئه‌وینداری› ٢. حولحولی؛ وازوازی؛ که‌لکه‌لی؛ عیشقی؛ خۆ به ده‌م خولیا و ئاره‌زووی جۆراوجۆره‌وه داو ‹آدم عشقی به درد کار ما نمی‌خورد: مرۆی حولحولی بۆ کاری ئێمه نابێ›.

**عشوه** / 'ešve، ـها/: [از عربی]/اسم. که‌شم؛ ناز؛ عیشوه؛ ناز و نووز؛ لاره؛ له‌نج؛ له‌نجه‌ولار؛ خنچکه؛ قه‌ژمه‌ری؛ خۆ و خده‌ی تایبه‌تی ژنانه بۆ ڕاکێشانی سه‌رنجی خه‌ڵک. هه‌روه‌ها: **عشوه آمدن؛ عشوه کردن**

**عشوه‌گر** / 'ešvegar، ـها؛ ـان/: [از عربی/ فارسی] صفت. به‌ناز؛ به لار و له‌نج؛ به که‌شم و ناز؛ عیشوه‌که‌ر؛ نازکه‌ر؛ نازفرۆش؛ ناز و نووزکه‌ر؛ به عینوان؛ به ته‌ور و تووز ‹زن عشوه‌گر: ژنی به‌ناز›.

**عشوه‌گری** / 'ešvegarî، ـها/: [از عربی/ فارسی]

/سم. ناز و نووز؛ لەنجە و لار؛ کەشم و ناز؛ تەور و تووز؛ کاری عیشوەکردن؛ نازکردن.

**عشیره** / 'ašîre ، ـها؛ عشایر/: [عربی]/سم. خێڵ؛ عێڵ؛ هۆز؛ تیرە و تایفە؛ عاشیرەت؛ عاشیرە؛ عەشرەت؛ خۆپان؛ کۆمار؛ عێڵ و عەشرەت؛ خۆپە؛ عەشیر؛ بەرە؛ بەشێک لە هۆز بریتی لە چەند بنەماڵە کە ئەندامانی پێکەوە پێوەندی ئابووری و نیشتمانیان هەیە.

**عصا** / 'asā ، ـها/: [عربی]/سم. گۆچان؛ گۆچانە؛ عاسا: ١. گۆچەل؛ گۆپار؛ گورچنگ؛ کۆپار؛ قەیسک؛ دارەکاز؛ گالۆکە؛ گالۆک؛ گالۆک؛ وەلەک؛ کەواز؛ وەکاز؛ وەقاز؛ شەبیک (شوانی)؛ مەشاک (دەروێشی)؛ دارعاسا؛ چێوشەق؛ گووچانگ؛ گۆپاڵ؛ قەلانگ؛ شاکۆن؛ هەچک؛ هەچی؛ داردەست؛ دارلۆق؛ دارلۆڤ؛ چیو؛ چەم؛ کەرەستەی وەک داردەس بۆ ڕێگەچوون یان وەستان ٢. *[مجازی]* پاڵپشت؛ پشتیوان؛ جێی دڵگەرمی (چ مادی، چ مەعنەوی) ‹اگر پسری داشتم امروز عصای دستم بود: ئەگەر کورێکم بوایە ئەمڕۆ عاسای دەستم بوو›.

**عصار** / 'assār ، ـها؛ ـان/: [عربی]/سم. دۆشاوگر؛ ئەوی شیرە و ڕۆنی گیا دەگرێ.

**عصاره** / 'osāre ، ـها/: [عربی]/سم. ١. شیلاو؛ ئاوگ؛ گویشک؛ گفیشک؛ کوشراو؛ ڕوب؛ دۆشاو؛ گوشەک؛ دمس؛ شۆک؛ خەستەوەکراوی ئاوی میوە و گژ و گیا ‹عصارەی انار؛ عصارەی سیب: دۆشاوی هەنار؛ ئاوگی سێو› ٢. پوختە؛ گیان؛ بەشی سەرەکی و هەڵبژاردەی نووسراوە یان وتەیێک ‹عصارەی حرفش این است کە باید بر اساس برنامە کار کرد: پوختەی قسەکانی ئەمەیە کە دەبێ بە پێی بەرنامە کار بکرێ›.

**عصاری** / 'assārî/: [عربی]/سم. ١. ئیسر؛ گویشکی؛ گفیشکی؛ کار و ڕەوتی دەرکێشانی شیلە و ڕۆنی گیا ٢. /ـها/ گووشینگە؛ کەرگە؛ کەرگان؛ کارگەی تایبەتی ئیسرکردن.

**عصازنان** / 'asāzanān/: [عربی/ فارسی] قید. چۆپچۆپان؛ دەس/ دەست بە گۆچان؛ دەس‌کوتان؛ کوێرەکوێر؛ دەس‌ماشان؛ بە پەل‌کوتان ‹عصازنان پلەها را بالا رفت: چووپچۆپان لە پلیکانەکانەوە چووە سەر›.

**عصا قورت‌داده** / 'asāqûrtdāde ، ـها/: [عربی/ ترکی/ فارسی] صفت. *[تعریض]* ١. ڕەپ؛ قنج و قیت؛ قوت؛ چێوەڕەق؛ دارەڕەق؛ داربەلەک؛ ڕەق و تەق و وشک و بێ‌جووڵە ‹مثل عصا قورت‌دادە شق و رق و ساکت و صامت نشستە بود، نە تکان می‌خورد و نە با کسی حرف می‌زد: ڕەپ و ڕاس و کپ و بێ‌دەنگ دانیشتبوو، نە دەجوولا و نە لەگەڵ کەس قسەی دەکرد› ٢. قەپۆزبەران؛ ئاخایۆک؛ فیزن؛ لووت‌بەرز؛ دەمارزل؛ ترزل؛ خۆ بە زل زان.

**عصاکش** / 'asākeš/: [عربی/ فارسی]/سم. چاوساخ؛ چاوساغ؛ چەمەساغ؛ کەسێ کە دەستی کوێرێک دەگرێ و لە ڕێ ڕۆیشتندا یارمەتی دەدا.

**عصب** / 'asab ، ـها؛ اعصاب/: [عربی]/سم. دەمار؛ دامار؛ دەزوولە ئاسای لەشی گیانەوەر کە کاری گەیاندنی هەموو دنەیەکە بە مێشک و مۆخ و بردنەوەی وەرامە بۆ ئەندامەکان.

▣ **عصب سیاتیک**: دەماری ڕەهێش؛ دەماری سیاتیک؛ دەماری هەست و جووڵەی پا.

**عصبانی** / 'asabānî/: [عربی] صفت. تووڕە؛ توێڕە؛ دەمارگرژ؛ ڕق‌هەستاو؛ کەشتەنگ؛ قوشقی؛ قورەژیلک؛ جەحنی؛ زرز؛ زوێر؛ زوور؛ زویر؛ بەهەجۆک؛ دهۆ؛ جنگز؛ قەڵس؛ دەهری؛ سڵ؛ ڕابەل؛ ڕاگەش؛ ئەنگر؛ قیسکەتەنگ؛ تەنگەتیلک؛ تەنگەتیلکە؛ تەنگەتیلەکە؛ ئاگری؛ توشی قەڵسی و نارەحەتی.

▣ **عصبانی شدن**: تووڕە بوون؛ ڕک هەستان؛ پنگان؛ قەڵس بوون؛ نگرین؛ عنگرین؛ عێتگرین؛ بەهەجین؛ زویر بوون؛ خەزرین؛ خەنزرین؛ خەیدین؛ غەیدین؛ جووش‌داین.
هەروەها: **عصبانی کردن**

**عصبانیت** / asabānîyyat' ، ـها/: [عربی]/اسم. تووڕەیی؛ توێڕەیی؛ کەشتەنگی؛ زرزی؛ خوریتی؛ ڕق‌هەستاوی؛ گەرووشەیی؛ جەحنینی؛ جنگزی؛ خوورژی ‹آرام باش! با عصبانیت کار پیش نمی‌رود: هێور بە! بە تووڕەیی کار ناچێتە پێشەوە›.

**عصب‌پایه** / asabpāye'/: [عربی/ فارسی]/اسم. زانستی ناسین و لێکدانەوەی پێکهاتە و چۆناوچۆنی کاری دەمار و نەخۆشی و دەرمانیان.

**عصب‌شناسی** / asabšenāsî'/: [عربی/ فارسی]/اسم. دەمارناسی؛ بەشێک لە زانستی پزیشکی کە لە سەر ناسینی کۆندامی دەماری، نەخۆشین و تێکچوونی دەکۆڵێتەوە ‹این اواخر در زمینەی عصب‌شناسی کار بسیار شده است: لەم دواییانەدا لەمەڕ دەمارناسیەوە کاری زۆر کراوە›: **نورولژی**

**عصبی** / asabî'/: [عربی] صفت. ١. دەماری؛ سەر بە دەمار ‹شوک عصبی: چڵەکانەوەی دەماری› ٢. [مجازی] گێزەڵ؛ دەمارگرژ؛ جنگوزی؛ جنگز؛ تووڕە؛ تونەمەجاز؛ تیزۆ؛ هەڵتۆزێن.

**عصبیت** / asabîyyat'/: [عربی]/اسم. ڕکە؛ ڕک؛ تووڕەیی؛ جنگزی؛ جنگوزی.

**عصر**[1] / asr' ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. ئێوار؛ ئێڤار؛ هیڤارە؛ هێوار؛ هەرێ؛ وەرگا؛ هەنجوورە؛ هەنگوور؛ هەنگوورە؛ هەنگۆری؛ ئەنگوری؛ هەیبۆر؛ هەنگڤار؛ هەنگۆرە؛ ئەنگۆرە؛ هنگوور؛ یەر؛ یەرە؛ یەری؛ عەسر؛ عەسران؛ سەرئێوارە؛ نێوان دوای‌نیوەڕۆ تا پێش خۆراوا بوون ‹الان عصر است و تو هنوز نهار نخوردەای: ئەوا ئێوارەیە و هێشتا فراوینت نەکردووە› ٢. /اعصار/ سەردەم؛ چاخ؛ دەورە؛ دەوران: /الف) دەورەی چالاکی کەسێک ‹عصر سنجرخان: سەردەمی سنجەرخان› ب) ڕۆژگار؛ ڕۆژیار؛ ڕۆزگار؛ کاتی بڕەو و پەرە سەندنی شتێ ‹عصر آهن: سەردەمی ئاسن› ٣. چەرخ؛ ماوەیەکی تایبەت لە مێژوو ‹عصر جدید: سەردەمی نوێ›.

◘ **عصر آهن**: سەردەمی ئاسن؛ دەورانێ لە مێژوو کە بە دەسکەوتنی ئاسن (لە دەوری ٤٠٠٠ ساڵ پێش) دەستی پێ‌کردووە و ئێستاش درێژەی هەیە.

**عصر حجر**: ڕۆژگاری بەرد؛ سەردەمی کوچک؛ دەورەیەک لە ژیانی مرۆڤ کە بە دروستکردنی ئامێری لە بەرد دەستی پێ‌کردووە.

**عصر حجر جدید**: نۆبەردی؛ ڕۆژگاری کەڤری نوێ.

**عصر حجر قدیم**: کۆن‌بەردی؛ ڕۆژگاری کەڤری بەری.

**عصر مفرغ**: ڕۆژگاری کانزا؛ خولێ لە مێژووی مرۆ کە بە چێ‌کرنی ئامێری مفرەغیەوە دەستی پێکرد (نزیک بە ٦٠٠٠ ساڵ پێش).

**عصر**[2]: قید. ئێواریێ؛ سەرئێوارە؛ دەمەعەسر؛ دەمەو عەسر؛ سەرئێوارە؛ سەر لە ئێوارە؛ سەرزێوارە؛ عەسر؛ عەسران؛ کاتی نێوان دوای نیوەڕۆ و ئێوارە ‹عصر رفتیم دیدن خالە: ئێواریێ چووینە سەردانی پوورم›.

**عصرانه** / asrāne'/: [عربی/ فارسی]/اسم. عەسرانە؛ هەنگۆرانە: ١. خواردنی سەر لە ئێوارە ٢. کاتی خواردنی سەر ئێوارە.

**عصمت** / esmat'/: [عربی]/اسم. [ادبی] خاوێنی؛ پاکی؛ بێ‌خەوشی؛ دووری لە گوناح؛ پواری؛ پاک و پواری.

**عصیان** / osyān, 'esyān' ، ـها/: [عربی]/اسم. لاساری؛ سەرپێچی؛ سەرپێچکاری؛ مل‌پێچی؛ یاخیەتی؛ کار یان ڕەوتی مل نەدان و بەرتەک دانەوە لە فەرمان، قانوون، یان ویستی خەڵک ‹سرانجام عصیان کرد و در برابر پدرش ایستاد: ئاخری لاساری کرد و لە ڕووی باوکیدا وەستاوە›.

**عضلات** / azolāt'/: [عربی] جمعِ ☜ **عضله**

**عضلانی** / azolānî'/: [عربی]/اسم. ماسوولەیی؛ ماسوولکەیی: ١. زەڤلەکی؛ وەرسەیی؛ سەر بە

ماسـوولکه ‹درد عضـلانی: ئێشـی ماسـوولەیی› ۲. گـرز؛ گـرس؛ ماسـوولکەی هەڵـتۆقیو ‹اندام عضلانی: ئەندامی ماسوولەیی›.

**عضـله** / 'azole، ـهـا؛ عضـلات/: [عربـی]/اسـم. ماسوولکە؛ ماسوولە؛ ماسیلکە؛ ماسیچە؛ مایچـە؛ ماهیچە؛ لەملانە؛ وەرسـە؛ وەرسـەلە؛ زەبلـەک؛ زیپەڕ؛ زەقلەک؛ گردک.

**عضـو** / 'ozv، ـهـا؛ اعضـا/: [عربـی]/اسـم. ئەنـدام: ۱. لەبات؛ بەشێ لە پێکهاتەی شتێ ‹چشم عضو بینایی انسان است: چـاو ئەندامـی بینـایی مرۆڤـە› ۲. پەل؛ هەر کـام لـە پێکهێنـەرانی کۆمەڵـێک ‹عضو جامعه: ئەندامی کۆمەڵگا› ۳. کەسێ کـە لـە لایەن پارت، کۆمەڵـە یـان دەسـتەیەکەوە گـڵ دراوەتەوە ‹عضو تیم شنا؛ عضو جمعیت محیط‌زیست: ئەندامی تیپی مەلەوانی؛ ئەندامی کۆمەڵەی ژینگە›. هەروەها: **عضو بودن؛ عضو شدن؛ عضو گرفتن**

**عضویت** / 'ozvîyyat/: [عربی]/اسم. ئەندامـەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ئەندام بوون.

▣ **به عضویت جـایی درآمـدن:** بوونـە ئەنـدامی جێگایەک؛ ئەندامەتی جێگایەک وەرگرتن ‹به عضویت تیم کوهنوردی درآمد: بوو بە ئەندامی تیمی شـاخەوانی›. هـەروەها: **بـه عضـویت جـایی درآوردن**

**عطا** / 'atā، ـها/: [عربی]/اسم. بەخشـش؛ خـەڵات؛ کار و ڕەوتی دانی شتێک بە کەسـێ، بەتایبـەت لە لایەن گەورەیەکەوە بۆ بچووکترێک.

▣ **عطای کسی را بـه لقـایش بخشـیدن:** *[تعـریض]* خێری کەسێ بەخشـینەوە؛ چـاو لـە خێـری کەسێک پۆشین.

**عطار** / 'attār، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. عەتار؛ ئـەوی بەهارات، دا و دەرمانی گیایی، تووی گوڵ و گیـا و شتی وا دەفرۆشێ.

**عطارد** / 'atārod/: [عربی] ☜ **تیر-۳**

**عطاری** / 'attārî/: [عربی]/اسم. عەتاری: ۱. /ـهـا/ دوکانێک کە گژ و گیای دەرمـانی و بـەهارات و تـووی گـوڵ و... تێـدا دەفرۆشـن ۲. پیشـەی عەتار.

**عطایا** / 'atāyā/: [عربی] جمعِ ☜ **عطیّه**

**عطر** / 'atr/: [عربـی]/اسـم. عـەتر: ۱. /ـهـا/ بـۆن؛ بۆنخۆشی؛ بۆنی خۆش ‹عطر گل‌ها؛ عطر غذا: بۆنـی گوڵان؛ بۆنـی چێشت› ۲. گوڵاو؛ گـوڵاڤ؛ تـراوێ کە بۆنی خۆشی لێوە دێت، بەتایبەت ئـەو تـراوە کە لە گوڵگوڵاوەوە دەگـیرێ یـان بـە جـۆرێکی پیشەیی لێ بەرهەم دێ.

**عطـرآگین** / 'atrāgîn/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. *[ادبی]* عەتراوی؛ بۆنخۆش؛ پـڕگوڵاڤ ‹فضـای بـاغ عطرآگین شده بود: نێو باخەکە عەتراوی ببوو›.

**عطرافشـان** / 'atrafšān/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. *[ادبی]* عەتراژن؛ لێهاتوو بۆ عەتراوی کردن ‹فضای باغ از گلها عطرافشان بود: نێو باخەکە لە بۆنی گـوڵان عەتراژن ببوو›.

**عطرافشـانی** / 'atrafšānî/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. عـەترپژێنی؛ عـەتراژنی؛ کـار یـان ڕەوتی بـڵاو کردنەوەی بۆنی خـۆش ‹گلهـا، بـاغ را عطرافشـانی می‌کردند: گوڵەکان، باخەکەیان عەترپژێنی دەکرد›.

**عطرپـاش** / 'atrpāš، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. عەترپاش؛ عەترپژێن؛ پژێنەکی عەتر؛ دەفرێکـی چکۆلەی شیشەیی کە بە لوولە و ترومپایەکـەوە عەتر دەپژێنێ.

**عطرمایـه** / 'atrmāye/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. ئیسانس؛ ماکی بۆنخـۆش یـان خـۆش چێـژەی زۆرتر خواردەمەنی.

**عطری** / 'atrî/: [عربی] صفت. بۆنخۆش؛ بـێهن‌دار ‹صابون عطری: سابوونی بۆنخۆش›.

**عطریـات** / 'atrîyyāt/: [عربـی]/اسـم. بۆنخۆشـی؛ دەوا و دەرمانی بۆنخۆش.

**عطسه** / 'atse، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. پشـمە؛ پژمـە؛ پنـژە؛ پێنـژ؛ پێنیـژ؛ پنـژ؛ ئارۆشـک؛ بێنشـک؛ بێنژک؛ بینشت؛ هەپش؛ فشک؛ کژ؛ دۆخـی لـە ناکاو و بە تێکڕا دەرپەڕینی هەوای نێو سـی لـە

دەم و لووتەوە.

◘ عطسه کـردن: پـژمین؛ پشـمین؛ پشـکین؛ پنـژین؛ پـەنژین؛ پـونژین؛ پژمـەی؛ پژمـای؛ کژین؛ فشکین؛ هلپشکین؛ هلپژکین؛ بێنژین؛ بێهنژین؛ بنشین؛ بهنژین؛ پێکـژین؛ پشـکان؛ کرچەنە؛ پژمەکردن: **عطسه زدن**

**به عطسه افتـادن:** کەوتنـە پژمـەپژم؛ کەفتنـە پژمە؛ کەوتەی پژمەی؛ تووشـی پشـمە هـاتن ‹چیزی رفت توی بینی‌ام و به عطسـه افتـادم: شـتێ چووە ناو لووتم و کەوتمە پژمەپژم›.

**عطش** / 'ataš/: [عربی]/سم. هـاش: ١. کـەڕافی؛ گڕەتینوەتی؛ گڕەتینیەتی؛ گڕەتینگی؛ تینـوەتی زۆر ‹عطـش داشـتم و هـر چـه آب مـی‌خـوردم، سیر نمـی‌شـدم: گـڕەتینوەتیم هـەبوو هـەر چـی ئـاوم دەخواردەوە تێر نەدەبووم› ٢. *[مجازی]* تامەزرۆیی؛ گڕە؛ گڕنە؛ گڕوو؛ گڕ؛ کفت؛ کفتوکـۆڵ؛ تـین و تاسـەی زۆر بـۆ دەسخسـتنی شـتێک ‹عطـش مطالعه؛ عطش دانستن: تامـەزرۆیی خوێنـدن؛ گـڕەی زانین›.

**عطف** / 'atf/: [عربی]/سم. ١. ئـاوڕ؛ کـار و ڕەوتی لاکردنەوە؛ ئاوڕدانەوە ‹این عطف بـه ماسبق اسـت: ئەمە ئاوڕ لە بگاردەیە› ٢. /ـها/ پشت؛ عەتف؛ ئـەو بەشـە لـە قـەراخی پـەرتووک کـە لاپـەڕەکانی پێکەوە لکاندووە ‹نام کتاب بر روی عطف هـم چـاپ شده است: نێوی کتێبەکە لە سەر پشتەکەشی چـاپ بووە›.

◙ **عطف به ماسبق:** ئاوڕ لە بگـاردە/ ڕابـردوو؛ بـە پێوەستی ئەوەی ڕابردوو؛ ڕەوتی ئـاوڕ دانـەوە بۆ دواوە؛ گەڕانەوە بۆ ڕابردوو.

**عطف توجه:** سەرنج دانەوە؛ تێڕوانی ‹بـا عطـف توجه به مدرک ارائـه شـده: بـه سـەرنج دانـەوە لـە بەڵگەی ئاراستەکراو›.

**عطوفت** / 'otûfat, 'utûfat/: [عربی]/سم. *[ادبی]* مێهرەبـانی؛ مێـرەوانی؛ مێهرەڤـانی؛ دلۆڤـانی؛ هێزی خۆش ویستن و بەزەیی.

**عطیه** / 'atîyye/، ـها؛ عطایا/: [عربی]/سم. *[ادبی]* دیاری؛ پێشکەشی؛ خـەڵات؛ دەسـەدیاری؛ ئـەو شتەی کە بە کەسێک دەبەخشرێ (بەتایبەت لـە لایەن کەسێکی گەورەوە).

**عظام** / 'ezām/: [عربی] جمعِ ☜ **عظیم**

**عظمـت** / 'azamat, 'azemat/: [عربـی]/سـم. گـەورەیی؛ گـەورایی؛ مەزنایـەتی؛ مـەزنی؛ بەشکۆیی؛ ژاژ و فەڕ؛ شکۆ و پایەبەرزی ‹عظمت کـوه؛ عظمـت تـلاش دانشـمندان: گـەورەیی کێـو؛ مەزنایەتی هەوڵی زانیاران›.

**عظـیم** / 'azîm/، عظـام/: [عربـی] صفت. بلـەرمان؛ مەزن؛ مازن؛ بلەرمە؛ زۆر گـەورە ‹کشـتی عظـیم؛ تلاش عظیم: گەمیەی بلەرمان؛ هەوڵی مەزن›.

**عظـیم‌الجثـه** / 'azîmoccosse/: [عربـی] صفت. زەبەلاح؛ قەویلە؛ زلزەلام؛ فیلەتەن؛ قەبە؛ تـەژە؛ گرس؛ گومرە؛ کەتـە؛ گـەپ؛ فیتـەر؛ زل ‹سـگ عظیم‌الجثه‌ای در گوشه‌ی باغ بسته شده بود: سـەگێکی زەبەلاح لە گۆشەی باخەکەوە بەسرابۆوە›.

**عظـیم‌الشـان** / 'azîmošša'n/: [عربـی] صـفت. شکۆمەند؛ شـکۆدار؛ ڕێـزدار؛ ڕێزمەنـد؛ پلـەبان؛ تایبەتمەندی کەسێ کە پلـەی کۆمەڵایـەتی لـە سەرەوەیە.

**عفاف** / 'efāf/: [عربی]/سم. *[ادبی]* داوێـن‌پـاکی؛ هێمۆیی؛ گوڵداوێنی؛ نارینی؛ خەنەکچانی.

**عفـت** / 'effat/: [عربـی]/سـم. داوێـن‌پـاکی؛ داوێن‌خاوێنی؛ گوڵداوێنی؛ هێمـۆیی؛ دۆخ یـان چۆنیەتی بێ‌گوناحی و ئاکارچاکی بەتایبـەت لـە باری ناموسیەوە.

**عفریت** / 'efrît/، ـها/: [عربی]/سم. دێو؛ عیفریت؛ هەفرید؛ درنج؛ نرناش؛ دێوەلـووکە؛ بوونـەوەری درێو و زراوبەر.

**عفریته** / 'efrîte/، ـها/: [عربـی]/سـم. دەڵـەدرنج؛ دەڵەدێو؛ دەڵەدێوە: ١. دێوی مێوینە ٢. *[مجازی]* فرتۆڵ؛ پیرعەبۆک؛ ژنی ناحەز و گرێجان.

**عفن** / 'afen/: [عربی] صفت. *[ادبی]* گەنیو؛ گەنیگ؛

گەنی؛ گەنیە؛ گەن‌پیس؛ گەنناک؛ گـەنیاگ؛ زۆر پیس و بۆگەن ‹مایعی عفن در ته جوی آب روان بود: تراوێکی گەنیو لە بنی جۆگە ئاوەکەوە دەڕۆیشت›.

**عفو** / 'afv/: [عربی]/اسم. چاوپۆشی؛ بەخشایشت؛ لێبووردوویی؛ نوخاف؛ عەفوو؛ عافوو؛ جەب؛ جەبە؛ کار یان ڕەوتی لێبوورین؛ بووردن؛ بەخشین؛ وەخشین؛ لێبوردن لە هەڵە و تاوان؛ لێخۆش‌بوون.

▣ **عفو عمومی**: بەخشینی گشتی؛ بووردنی گشتی/ گلایی؛ لێبووردنی هەموو ئەو کەسانە کە قانوون بە شۆنیانەوەیە.

▣ **عفو به کسی خوردن**: بەخشین بەر کەسێک کەوتن؛ چاوپۆشی و بەخشین بە کەسێ گەیشتن ‹اگر به عفو می‌خورد، حالا پیش زن و بچەاش بود: ئەگەر بەخشین بەری بکەوتایە، ئێستا لای ژن و منداڵیەوە بوو›.

**عفو شدن**: بەخشران؛ بەخشیان؛ بەخشیای؛ لێخۆش بوون؛ عافووکردن؛ نوخاف‌کران ‹جمعی از زندانیان عفو شدند: کۆمەڵێ لە بەندیان بەخشران›.

**عفو کردن**: عافووکردن؛ گوزەشت‌کردن؛ بووردن؛ بوورین؛ بەخشین؛ بەخشای؛ بگـردن؛ لێبوردن؛ خۆشبوون؛ لێخۆشبوون ‹دولت فراریان را عفو کرد: دەوڵەت هەڵاتوانی بەخشی›.

**عفونت** / 'ofûnat, 'ufûnat/، ـها/: [عربی]/اسم. ١. چڵک؛ چرک؛ کێم؛ زووخ؛ زیرگ؛ ئاشۆ؛ هەو؛ هەوا؛ ڕیم؛ زینجکاو یان برینێ کە لە هۆکارەکانی نەخۆشیزاوە بەدی‌دێت ٢. کفکۆ؛ بۆگەن؛ بۆنی پیس؛ بێهناگەنی.

▣ **عفونت کردن**: چڵک‌کردن؛ ئاوکردن؛ ئاوجز کردن؛ پەیدا بوونی زنچکاو لە برین و کوان.

**عفونی**/ 'ofûnî, 'ufûnî/: [عربی] صفت. ١. چڵکی؛ زووخی؛ سەر بە چڵک یان سەرچاوە گرتوو لە چڵکەوە ‹بیماری عفونی: نەخۆشینی چڵکی› ٢. بۆگەن؛ بێهناگەن؛ بۆن‌پیس؛ بە بۆنی خراپ و ناخۆشەوە ٣. زووخهێناو؛ زۆخهێناو؛ چڵکی؛ زووخی ‹زخم عفونی شده: برینی زووخ‌هیناو›.

**عفیف** / 'afîf/: [عربی] صفت. ١. داوێن‌پاک؛ گوڵ‌داوێن؛ داوێن‌خاوێن ٢. گوڵپاک؛ پەڕەی گوڵ؛ شیرپاک؛ بە ئاکارێکی دوور لە هەرزەیی، هاری و بێ‌شەرمی.

**عفیفه** / 'afîfe/: [عربی] صفت. داوێن‌پاک؛ گوڵ‌داوێن؛ ژنی داوێن‌خاوێن.

**عق** / 'oq/: صوت. *[گفتاری]* هێڵنج؛ فرتک؛ هێق؛ حێق؛ ئێق؛ وێق؛ هیێح؛ هوێح؛ وێع؛ ئێع؛ یێع؛ ئۆع؛ وۆع؛ دەنگی ڕشانەوە: **أق**

▣ **عُق زدن**: ڕشانەوە؛ هەڵاوردنەوە؛ هێنانەوە؛ هاوردنەوە؛ هەڵهاوردنەوە؛ ئێق‌کردنەوە؛ قەسیان؛ زێڵەوە شیویەی.

**عُق کسی گرفتن**: دڵی کەسێک هەڵشێوان؛ دڵ کەسێک هاتنە یەکا؛ دڵی کەسێک تێکەڵ بوون: ١. تووشی ڕشانەوە بوون ٢. *[کنایی]* دڵی کەسێک پێکدا/ بە یەکداهاتن؛ هەستی بێزاری زۆرکردن ‹از دیدن قیافه‌اش عُقم می‌گرفت: لە دیتنی سەر و پۆتکی دڵم بیکدا دەهات›.

**عقائد** / 'aqā'ed/: [عربی] ☜ **عقاید**

**عقاب** / 'oqāb/: [عربی]/اسم. ١. ـها؛ ـان/ هەڵۆ؛ هەڵوو؛ هکور؛ ئەڵو؛ ئەلە؛ ئلە ؛ وڵە ؛ ئلهۆ؛ ئەلهۆ؛ ئەڵۆ؛ ئالۆ؛ هولی؛ ئەلوو؛ ئەلوە ؛ هەرۆ؛ ئەیلۆ؛ سپر؛ کورت؛ سەرکنەک؛ هەر کام لەو پەلەوەرە گەورە و بەهێزانەی ڕۆژڕاو، بە باڵی درێژ و پان، سەر و دەندووکی زل، کلکی تەخت و پێی تووکنەوە، کە لە سەر دار و تاشەبەردی شاخان هێلانە دەکەن ٢. *[نجوم]* ☜ **شاهین ـ ۴**

**عقابی** / 'oqābî/: [عربی] صفت. هەڵۆیی؛ ئەلوویی؛ ئالۆیی؛ بە چەشنی هەڵۆ ‹بینی عقابی: کەپۆی هەلویی›.

**عقال** / 'eqāl/: [عربی]/اسم. عەگاڵ؛ پەتی سەری عارەبان.

**عقایـد** / 'aqāyed/: [عربـی] جمـعِ ☜ **عقیـده: عقائد**

**عقب**[1] / 'aqab ، ـها/: [عربی]/سم. دوا؛ دواوه؛ دمـا؛ دومـا؛ دوومایـیـک؛ دوویـا؛ پشـتەوه؛ پـاش؛ نـوا؛ پشـتەو؛ پشـت؛ لا و شـوێنێ کـه دەکەوێتـه پشتەوەی بێژەر، بیسەر یان شتی ئاماژەپێ‌کـراو ‹عقب خیلی سنگین است: دواوه زۆر قورسه›.

**عقب**[2]: *صفت*. دوا؛ دوویا؛ پـاش؛ دواوه؛ دمـا؛ نـوا؛ دمایی؛ دوایی: ۱. پشتی؛ له پشت سەر ئەوی‌تـر یـان دیترانـەوه ‹درِ عقـب: دەرکـی پشـتی› ۲. شێنەیی و هێواش‌تر له رادەی پێویست یـان لـه دیتـران ‹سـاعت عقـب اسـت: کاتژمێرەکـه لـه دواوەیـه› ۳. دوور؛ بـه مەودایـەکی کـاتی یـان جێگاییەوه ‹از آن عقب‌تر را نمی‌بینم: لـەوه دوورتـر نابینم›.

▣ **عقب بودن**: له دوا/ دواوه/ دوادا بوون؛ دمـاوه بیەی؛ دوور بـوون لـه ئاکـام یـان شـوێنێکی تایبەت ‹هنوز از بقیه عقب است: هێشـتا لـه دوای ئەوانی‌تره›.

**عقـب**[3]: *قیـد*. دوا: ۱. دواوه؛ دمـاوه؛ پاشـەوه؛ پشتەوه؛ له بەشی دواوه ‹عقب ماشین نشست: لـه دواوەی ماشینەکه دانیشت› ۲. بـه/ لـه دوای؛ بـه دمای؛ به شوێن؛ بـه شـوون ‹فرسـتاد عقـب معلم: ناردی له دوای مامۆستا›.

▣ **عقب افتادن**: دواکەوتن؛ مانەوه؛ وەدواکەوتن؛ کەوتنـه دواوه؛ کەوتـەی دمـاوه: ۱. درێـژ بوونەوەی کاتی کار یان ڕووداوێ ‹دادگـاه یـک مـاه عقـب افتـاد: دادگاکـه مانگـێ وەدوا کـەوت› ۲. جێمـان؛ بـەجێمان؛ هێـواش بوونـەوەی ڕەوتی جوولانەوه یان پێشـکەوتن ‹سـاعت ۱۰ دقیقـه عقـب مـی‌افتـاد: کاتژمێرەکـه ۱۰ خولـەک دەکەوتە دواوه›.

**عقـب انـداختن**: وەدوا خسـتن؛ دوا خسـتن؛ پەک وسەی؛ خسـتنه دواوه؛ وسـتەی دمـاوه؛ هاویشتنه پاشـەوه؛ کـاتی کـار یـان ڕووداوێ بردنـه دواوه ‹سـفرت را دو روز عقـب بیانـداز: سەفەرەکەت دوو ڕۆژ وه دوا خه›.

**عقب رانـدن**: دانـه دواوه: ۱. خزاندنـه دواوه؛ دواوه لێخورین؛ تـەک پێـدان؛ پاشەکشـه پـێ کردن؛ کشـاندنه دواوه؛ بـه پاشـگەز بوونـەوه ناچارکردن ‹دشمن را عقب راندنـد: دوژمنیـان دا دواوه› ۲. دانـه لاوه؛ کێشـانه دواوه؛ بـۆ دواوه لابردن و هەڵگەڕاندنەوه ‹سنگ و خاک را عقب راند و او را از زیر آوار درآورد: بەرد و خۆلەکەی دایه لاوه و له ژێر کەلاوەکه دەری هێنا›: **عقب زدن**

**عقب رفـتن**: ۱. چوونـه/ ڕۆشـتنه دواوه؛ دواوه چوون؛ پاشـڤـه چـوون؛ دواچـین؛ دوومایـیـک چوون؛ لوایوه دمـا؛ لـوەوه دمـای؛ بـەرەو لای پاشەوه جمین ‹عقب برو، از آنجـا دور بـزن!: بـڕۆ دواوه، لەوێ سوور بدەوه!› ۲. *[کنایی]* کشـانەوه؛ تـەک دانـه دواوه؛ پاشـگەزکردن؛ پاشەکشـێ کردن؛ له پێشـکەوتن مانـەوه ‹امسـال آب دریـا خیلی عقب رفتـه اسـت: ئەوسـاڵ ئـاوی دەریـا زۆر کشاوەتەوه›: **عقب نشستن**

**عقب زدن** ☜ **عقب راندن ـ۲**

**عقب ـ عقب رفتن**: دواـ دوا/ دواوەدوا/ پشـتاو پشـت چـوون؛ پشـتەڵ پشـتێ چـوون؛ پشتاوپشت ڕۆیشتن؛ پەشتەروانێ لوەی.

**عقب کسی/ چیزی رفتن**: به/ لـه دوای/ دووی کەسێکدا چـوون؛ دوای کەسـێ یـان شـتێک چوون؛ چوونه شوێن کەسێ یا شتێ؛ وه دوای کەسێ یان چتێ چوون؛ شۆنۆ یۆی/ چێوێـوی لوەی؛ بۆ دیتنەوه یـان هێنـانی کەسـێ یـان شتێ ڕۆیشتن ‹رفتـه بـود عقـب دکتـر: لـه دووی دوکتور ڕۆیشتبوو›.

**عقـب کشـیدن**: کشـانەوه؛ کێشـانه دواوه: ۱. پاشەکشـێ کـردن؛ تـەک دانـه دواوه؛ کێشتەیوه دما؛ چاوپۆشی کردن له کارێ ‹آزاد خودش را عقب کشید و بقیه هم بـه دنبالش: ئـازاد پاشەکشی کـرد و ئـەوانی دیکـەش بـه شـوێنیدا

بـرِی› ٢. هەڵکێشـان؛ هۆرکێشـتەی؛ بـەرەو دواوە بردن ‹پایت را عقب بکش!: پێت بکشیوە!›.

**عقب ماندن**: دوا کـەوتن؛ جێمـان؛ بـەجێمان؛ کەوتنـە دواوە: ١. بـە کـەس یـان تاقمـێ نەگەیشـتن ٢. *[کنـایی]* لـە دواوە بـوون؛ کەوتـەیوە دمـا؛ لـە مەبەسـتی دیـاریکراو بەجێمان ‹از کـارم عقـب مانـدەام: لـە کارەکـەم دواکەوتووم›.

**عقب نشستن** ☜ **عقب رفتن ــ٢**

**عقبا** / oqbā'/: [عربی] ☜ **آخرت؛ عقبی**

**عقب‌افتـاده** / aqaboftāde, -'oftāde'، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت*. دواکـەوتوو؛ دواکەوتـە؛ دواکـەفتی؛ دواکـەفتگ؛ دواکـەتی؛ دماکـەوتی؛ دماکەوتە: ١. لـە کـاتی خـۆی تێپـەڕیو ‹بـدهی عقب‌افتاده: قەرزی دواکـەوتوو› ٢. *[ـگـان/[مجـازی]* جێماو؛ بەجێماو ‹بچەهـای عقب‌افتـاده: منـداڵانی دواکەوتوو›.

**عقبگرد** / aqabgard'/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. ١. کار یـان ڕەوتی بادانـەوە؛ هەڵـگەڕانەوە ٢. *[نظـامی]* بەرەوپاش؛ جووڵەی سەربازی بـۆ گەڕاندنـەوەی لەش بەرەو پێچەوانەی لای پێشوو.

**عقب‌مانـدگی** / aqabmāndegî'، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/*اسـم*. دواکـەوتوویی؛ دواکـەفتگی؛ دماکەوتەیی؛ بار و دۆخی دواکەوتن لـە گەشـە، پێشکەوت یان ڕەوتێکی دیاریکراو.

**عقب‌مانـده** / aqabmānde'، ـهـا؛ ـگـان/: [عربـی/ فارسی] *صفت*. دواکەوتوو؛ دواکـەفتگ؛ دواکـەفتی؛ دواکەوتە؛ دماکەوتـە؛ تووشـیاری دواکـەوتوویی ‹کشور عقب‌مانده: وڵاتی دواکەوتوو›.

**عقب‌نشینی** / aqabnešînî'، ـها/: [عربـی/ فارسـی] *اسم*. پاشەکشێ؛ پاشەکشە؛ پاشگەزێ؛ کشە؛ کار یان ڕەوتی کشانەوە لـە مەترسـی، دژواری یـان ئاستەمی بۆ تاوێک یان بۆ هەمیشە ‹دو طـرف بـە آن سوی مرزهای خود عقب‌نشـینی کردنـد: دوو لایـەن بەرەو ئەو لای سنووری خۆیان پاشەکشێیان کرد›.

▣ **عقـب‌نشـینی کـردن**: پاشەکشـێ/ پاشەکشـە کـردن؛ پاشـگەز بوونـەوە؛ پاشـگەزی کـردن؛ کشانەوە.

**عقبی** [1] / aqabî'/: [عربی] *صـفت. [گفتـاری]* پشـتی؛ پشتەسـەری؛ پشـتسـەری؛ دوایـی؛ دوایـین؛ دمایی؛ دمەین؛ دواوە ‹درِ عقبی: دەرکەی پشتی›.

**عقبـی** [2] / ـهـا/: [عربـی] *ضـمیر. [گفتـاری]* دوایـی؛ پشتەسەری؛ پشتی؛ دماین؛ دمەین؛ کەسێ کـە لە پشت یان لە دوای کەسێکەوە بێ ‹آن عقبـی لباس خاکی پوشیده بود: ئەوی دوایی جلکێ خاکی لـە بەر کردبوو›.

**عقبی** / oqbā'/: [عربی] ☜ **عقبا**

**عقد** / aqd'، ـها؛ عقود/: [عربی]/*اسم*. ١. گرێـدانک؛ کـار و ڕەوتی پـەیمان بەسـتن ‹عقـد قـرارداد: گرێـدانکی بڕیارنامـە› ٢. *[اسـلام]* پـەیمان؛ ڕێوڕەسمێ کە لە گرێ خواردنی پـەیمان یـان بەڵێن دانێکدا و دەربڕینی بەڵێنی هەر دوو لا و بـوونی گـەواهان بـەڕێوە دەچـێ (وەکـوو ڕێوڕەسمی مارەیی کچ و کوڕ بۆ ژیانی هاوبەشی).

▣ **عقد انقطاع**: گرێدانکی ماوەیی. بەرانبەر: **عقد دایم**

**عقـد جـایز**: گرێـدانکی ڕەوا؛ پـەیمانێ کـە هەڵوەشاندنەوەی تێدا ڕەوایە.

**عقد دایم**: گرێدانکی هەمیشەیی؛ پەیمانێ کـە ماوەی تێدا دیـاری نـەکراوە. بەرانبـەر: **عقـد انقطاع**

**عقد فاسد**: گرێدانکی گەندەڵـە؛ پـەیمانێ کـە هەڵومەرجی پێویستی تێدا ڕەچاو نەکرابێ.

▣ **عقد بستن**: *[ادبی]* پەیمان بەستن؛ دەسـتدان؛ بەڵێن دان ‹آن دو عقد بـرادری بسـتە بودنـد: ئـەو دوانە پەیمانی برایەتیان بەستبوو›.

**عقد کردن**: مارە برین؛ مارەکردن؛ مـەهرکرن؛ مارکرن؛ ماربڕین؛ ژن و شـوو حەڵاڵـی یـەک کردن ‹عاقد آمـد و آنهـا را عقـد کـرد: مـەلا هـات مارەیانی بری›.

**به عقد کسی درآمدن:** بۆ/ لە کەسێ مارەکران/ بڕیان؛ شوو کردنە کەسێ؛ بوونە هاوسەری کەسێ ‹به عقد پسر عمویش درآمد: بو کوری مامەی مارە کرا›.

**به عقد کسی درآوردن:** بۆ/ لە کەسێک مارە کردن؛ بە هاوسەری کەسێک دەرهێنان؛ مارە کردن لە کەسێک ‹او را به عقد پسر عمویش درآوردند: بو کورەمامی مارەیان کرد›.

**عقدکنان** / aqdkonān' ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. مارەبران؛ مارەبڕین؛ مارەبڕیەی؛ نیکهـ ؛ ڕێ و ڕەسمی تایبەت بۆ لێک حەلاڵکردنی ژن و پیاو یان کچ و کوڕ ‹دیروز عقدکنان سارا بود: دوێکە مارەبرانی سارا بوو›.

**عقدنامه** / aqdnāme' ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. مەهرنامە؛ بەڵگەیێکی ڕەسمی و قانوونی کە تێیدا ناوی ژن و مێرد و ڕێکەوت و دۆخی مارەبڕان نووسراوە.

**عقده** / oqde' ، ـها/: [عربی]/اسم. گرێ: ١. *[کالبدشناسی]* لک؛ لوو؛ گرە؛ سفتی ژێر پێست یان ناوەوەی لەش ٢. *[روانشناسی]* گریمانە؛ بیر، بیرەوەری یان خوازەیەک کە بە تەواوی یان بەشێکی سەرکوتکراوە و هەست و سۆزی ئەو کەسەی ئاوێتە بووە و لەگەڵ بیر و بۆچوونەکانی دیکەیدا لە دژایەتی و مشتومڕدایە.

▣ **عقدەی ادیب:** گرێی ئودیپ؛ خۆش ویستنی ئێجگار زۆری دایک و ڕق لە باب (بۆ کوڕان).

**عقدەی الکترا:** گرێی ئیلکترا؛ خۆش ویستنی ئێجگار زۆری باب و ڕق لە دایک (بۆ کچان).

**عقدەی حقارت:** گرێی خۆ بە کەم زانی؛ گریمانەیێ کە بە هوی سووکی پێکردنی زۆر و لە سەر یەک لە کەسێکدا بەدیدێ.

**عقدەی خود بزرگ‌بینی:** گرێی خۆ بە زلزانی/ ئاخایۆکی؛ گریمانەیێ کە دەبێتە هۆی ئەوە کابرا خۆی بان‌تر و سەرتر لەوەی کە هەیە بزانێ.

▣ **عقدەی دل باز کردن/ گشودن:** *[مجازی]* دەردی دڵ هەڵڕژاندن؛ سفرەی دڵ کردنەوە؛ خۆ سووک کردنەوە؛ گرێی ناو دڵ شی کردنەوە؛ داخ و خەفەتی دڵ هەڵڕژاندن و سووک بوونەوە.

**عقده دل کسی ترکیدن:** *[مجازی]* کوانی دڵی کەسێ درگا کردن؛ بلۆقی سکی کەسێک تەقین؛ ئاشکرا بوونی ڕەنج و ئازراوی کەسێک بە گوتنی ئەو نەهامەتیانە.

**عقده‌ای** / oqde'ī' ، ـها/: [عربی] *صفت.* ڕقلەسک؛ گریمانەیی؛ گرێ لە دڵ؛ تووشی تێکچوونی ئاکار و داوەری بە هۆی دڵشکاوی و پێشێل بوون ‹وقتی به یک آدم عقده‌ای مسئولیتی می‌دهند، پدر ارباب‌رجوع را درمی‌آورد: کاتێ مرۆیەکی ڕقلەسک دەکەنە بەرپرس، باوکی کارێنەر دێنێتە بەرچاوی›.

**عقدی** / aqdî'/: [عربی] *صفت.* مارەبڕاو؛ مارەکراو؛ مارەبڕیاگ؛ مارەکراوی هەمیشەیی. بەرانبەر: **صیغه‌ای** ‹سارا زن عقدی من است: سارا ژنی مارەبڕاوی منە›.

**عقرب** / aqrab'/: [عربی]/اسم. دووپشک: ١. *[ـها/]* دوپیشک؛ دووفیشک؛ دووڤپشک؛ مارەکۆڵ؛ دومارەکۆڵ؛ دوومارەکۆڵ؛ دمارەکۆڵ؛ کولەنجی؛ کولاژدم؛ کەژدم؛ کەلاشدوم؛ کلاشدم؛ ژووشک؛ زووشک؛ کەشگە؛ کشگە؛ گادین؛ چزەپیلە؛ گیانەوەرێ بە لەشی درێژ، سەرسنگی چڕ و پان و چەسپاو بە سکەوە، پای گەورەی وەک شەویلاک، چزی قولاو ئاسا لە دوای کلکەوە کە لە ناوەوە دەگاتە دوو لووی ژەهر دەڵێن. ئەم گیانەوەرە ڕاوچیەکی گۆشتخۆر، هێلکەکەر (گەراداخەر) و زیندوزێیە و لە ناوچەی گەرم و مامناوەندیدا دەژی و زۆرتر شەوگەڕە ٢. *[نجوم]* وێنەیەکی گەورەی ئاسمانی ✽ **کژدم** ٣. *[تقویم]*

هەشتەمین کەلوو لە دوازدە کەلووی ساڵ کە بەرامبەرە بە مانگی خەزەڵوەر.

▣ **عقرب جراره:** دووپشکی سەرپان؛ جۆرێ دووپشکی زل و زەردی زۆر ژاراوی کە کلکی لە دووی دەخشێ: **جراره**

**عقربــک / 'aqrabak/:** [عربی/ فارسی]/اسم. دووی‌پشک؛ ناخوونەزێ؛ برینێ کە لە چلک کردنی نەرمەی دەوری نینۆکەوە بەدی‌دێ.

**عقربه / 'aqrabe/، ـها/:** [عربی]/اسم. مێهەنگ؛ میهەنگ؛ دەسیلە؛ میل؛ نیشانکەر؛ میلەیەک لە نێو دەزگایەکدا کە سەرێکی بە تەوەرەیەکەوەیە و ئەو سەری لە نێو پەرەیەکدا هەڵدەسووڕێ و چەنێتی یان لایەنێک نیشان دەدا ‹عقربەی ساعت: مێهەنگی کاتژمێر›.

**عقل / 'aql/، ـها؛ عقول/:** [عربی]/اسم. ئاوەز؛ ئەقڵ؛ هەقڵ؛ ئقل؛ مژی؛ مەژگ: ١. هزر؛ بیر؛ هش؛ ویر؛ هێزی تێگەیین، بۆچوون یان تێفکرین، بەتایبەت بە شێوەی گونجاو ٢. توانستی بەهرەگری ڕاست و باش لە هێزی زەینی.

▣ **عقل سلیم:** بیر/ ئەقڵی پاراو؛ هێزی بیر و تێگەیشتنی مرۆی ساغ و ئاسایی.

**عقل کل:** ژیرە؛ بیر قووڵ؛ بیر تیژ؛ زۆر زانا و بیرمەند.

**عقل متعارف:** بیر/ ئەقڵ/ ژیری ئاسایی؛ تێگەیشتن و داوەری وەک مرۆیەکی ئاسایی.

**عقل معاش:** بیر/ ژیری بژیو؛ بیر/ ژیری ئابووری؛ لێهاتوویی کەسێ بۆ بەرنامە دارشتن و بەڕێوە بردنی ژیان.

▣ **عقل از سر کسی پریدن:** */مجازی/* شێتی لە سەر/ کەلەی کەسێک دان؛ ئەقڵ لە سەر کەسێک دەرپەڕین/ بارکردن؛ شێت بوونی کەسێک؛ مێشکی کەسێک تێکچوون؛ لێوە بوونی کەسێک ‹مگر عقل از سرت پریده کە این کارها را می‌کنی؟!: مەگەر شێتی داویە لە سەرت ئەم کارانە دەکەی؟!›.

**عقل خود را بە دست کسی دادن:** */مجازی/* ئەقڵی خۆ دانە دەستی کەسێکەوە؛ کەفتنە شوێن قسەی کەسێ؛ ئەقڵ خۆ گۆڕانەوە؛ خۆ سپاردنە کەسێکی‌تر ‹آخر چرا عقل خودت را می‌دهی دست دیگری؟: ئاخر بۆ ئەقڵی خوت ئەدەیتە دەستی کەسی تر؟›.

**عقل(ها) را روی هم گذاشتن:** بیر کردنە یەک؛ ئەقڵ نانە سەر یەکەوە ‹عقلمان را روی هم گذاشتیم و بە این نتیجە رسیدیم: بیرمان کردە یەک و بەم ئاکامە گەیشتین›.

**عقل کردن:** ژیری کردن؛ ژیرانەکردن؛ ژیرانە کارکردن؛ کارکردن بە ئەقڵەوە ‹خوب بود عقل کردم و زود آمدم: چابوو ژیریم کرد و زوو هاتم›.

**عقل کسی بە چشمش بودن:** */مجازی/* ئەقڵی کەسێ لە چاویدا بوون؛ لە ڕووی ڕواڵەتی بەرچاو بڕیار دان و داوەری‌کردن ‹خیلی‌ها عقلشان بە چشمشان است: زۆرێک ئەقڵیان لە چاویاندایە›.

**عقل کسی پارە سنگ برداشتن:** */مجازی/* ئەقڵی کەسێ سێ‌سووچ بوون؛ تەختەی کەسێک داکەوتن؛ کەم ئەقڵ بوون ‹این دوست ما عقلش پارەسنگ برمی‌دارد: ئەو دۆستەی ئێمە ئەقڵی سێ‌سووچە›.

**عقل کسی را دزدیدن:** */مجازی/* چاوی کەسێک بەستن؛ لە کەسێ گۆڕاندن؛ ئەقڵی کەسێک لە چنگی دەرهێنان؛ ئەقڵی کەسێک دزین؛ بە دەست هێنانی متمانەی کەسێک لە ڕێی هەڵفریواندنیەوە ‹عقل نو را دزدید و با چرب‌زبانی مغازە را از دست درآورد: چاونی بەست و بە زمان‌لووسی دووکانەکەی لە چنگت دەرهێنا›.

**عقل کسی رسیدن:** ئەقڵی کەسێ پێ‌شکیان؛ ئەقڵی کەسێک پێ‌گەیشتن؛ ئەقڵی کەسێک بۆچوون ‹هنوز بچە است عقلش نمی‌رسد: هێما منداڵە و ئەقڵی پێ‌ناشکێ›.

**عقل کسی قد ندادن:** *[مجازی]* ئەقڵی کەسێ پێ نەشکیان؛ ئەقڵ کەسێ نەبڕین؛ بە ڕێجاڕیشا نەچوون؛ توانستی فامی شتێک نەبوون ‹عقل تو به این چیزها قد نمی‌دهد: ئەقڵی تو بەم شتانە ناشکێ›.

**عقل کسی گرد بودن:** *[مجازی]* مێشکی کەسێ پووچڵ بوون؛ بیری کەسێک تەسک بوون؛ کەم ئاوەز بوون ‹مگر عقلت گرد است که ترک تحصیل کنی؟: مەگەر مێشکت پووچڵە دەس لە خوێندن بەردەی؟›.

**به عقل درست/ راست آمدن:** لەگەڵ ئەقڵدا ڕاست هاتنەوە؛ لە تەک عەقلا دەرهاتن؛ لەتەک عەقلا خوێندن/ خواردن ‹حرفش با عقل درست می‌اید: قسەکەی لەگەڵ ئەقڵدا ڕاست دێتەوە›.

**به عقل کسی نرسیدن:** ئەقڵی کەسی پێ نەشکیان؛ بە ئەقڵی هیچ کەسێک نەگەیشتن ‹به عقل کسی نرسید زودتر به پلیس زنگ بزند: کەس ئەقڵی پێ نەشکا زوو پولیس دەنگ کا›.

**به عقل نگنجیدن:** مێشک/ ئەقڵ هەڵنەگرتن؛ ئەقڵ نەوڕین ‹به عقل کسی نمی‌گنجید که او بتواند این کار را بکند: مێشکی کەس هەڵی‌نەدەگرت ئەو بتوانێ ئەم کارە بکا›.

**عقلا** / 'oqalā/: [عربی] جمعِ ☜ **عاقل**

**عقلائی** / 'oqalā'î/: [عربی] ☜ **عقلایی**

**عقلانی** / aqlānî/: [عربی] *صفت.* هزری؛ ئاوەزی ‹قوەی عقلانی: هێزی هزری›.

**عقلانیت** / 'aqlānîyyat/: [عربی] *اسم.* ژیریەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ژیر بوون.

**عقلایی** / 'oqalāyî/: [عربی] *صفت.* ژیرانە؛ ژیرمەندانە؛ ژیرمەندی؛ ژیرۆکی؛ ژیرۆڵی؛ ژیرلێی؛ عاقڵانە ‹تصمیم عقلایی: بڕیاری ژیرانە›: **عُقلائی**

**عقلی** / 'aqlî/: [عربی] *صفت.* ئاوەزی؛ ئەقڵی؛ هزری.

**عقوبت** / 'oqûbat, 'uqûbat/ ، ـها/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* سزا؛ جزیا؛ وەرامی خراپە یان کاری خراپ ‹عقوبت دیدن: سزا دیتن›.

**عقود** / 'oqûd, 'uqûd/: [عربی] جمعِ ☜ **عقد**

**عقول** / 'oqûl, 'uqûl/: [عربی] جمعِ ☜ **عقل**

**عقیدتی** / 'aqîdatî/: [عربی] *صفت.* بڕوایی؛ باوەڕی؛ سەر بە بیر و بڕوا ‹بحث عقیدتی: باسی بڕوایی›.

**عقیده** / 'aqîde/ ، ـها؛ عقاید/: [عربی] *اسم.* بڕوا؛ باوەڕ؛ باوڕ؛ هەنی: ١. بیر و بڕوا؛ دۆز؛ بیر و بۆچوون؛ داوەری یان هزرێ کە وەک خوو و خدە یان حاڵەتێکی زەینی لێهاتووە ‹عقیدەی اسلامی: باوەڕی ئیسلامی› ٢. بۆچوون؛ بیر و بۆچوونێ کە ئاوێتەی هەست و نەست بووە ‹عقیدەی شما در مورد ازدواج آرام چیست؟: بۆچوونی ئێوە لەمەڕ ژنخواستنی ئارامەوە چیە؟›.

⊡ **عقیده داشتن:** بڕوا هەبوون؛ باوەڕ پێبوون؛ بە بڕوا بوون؛ پێوا بوون؛ باوەڕ بیەی ‹من به کار این آدم عقیده داشتم: من بڕوام بە کاری ئەم کابرایە هەبوو›.

**عقیق** / 'aqîq/: [عربی] *اسم.* ئاقێق؛ یاقیق؛ جۆرێ کانی جوان و بەنرخ لە کوارتز (سیلیکا) کە هەندێ ئۆکسیدی ئاسنی تێدایە، بە ڕەنگی خۆڵەمێشی مەیلەو زەرد، سوور یان شین کە وەکوو بەردێکی بەنرخ یان بۆ دروستکردنی ئامرازی زانستی بەکار دێت.

**عقیقه** / 'aqîqe/: [عربی] *اسم.* هەقیقە؛ حەفتم؛ حەوتم؛ کاوڕ یان شەکێ کە لە حەفتەی لە دایکبووندا قوربانی دەکەن.

**عقیم** / 'aqîm/: [عربی] *صفت.* ١. نەزۆک؛ نەزووک؛ نەزێ؛ نەزا؛ مەزا؛ هەرکان؛ خرش؛ بەیچەڵ؛ پەیشەل؛ بێبەر؛ بێتوانایی مناڵ بوون ٢. *[مجازی]* بێکەڵک؛ زڕ؛ بێبەر؛ بێوەچ؛ بەبێ ئاکامی ڕەچاوکراو ‹تلاشهای دشمن برای پیروزی عقیم ماند: هەوڵی دوژمن بۆ سەرکەوتن بێکەڵک

مایەوە›.

▣ **عقیم بودن:** نەزۆک بوون؛ نازا بوون؛ هەرکان بوون؛ بەبێ توانایی زاوزێ کردن بوون ‹همسر دوم شاه عقیم بود: ژنی دووهەمی شا نەزۆک بوو›.

**عقیم شدن:** ١. نەزۆک بوون؛ لە دەست دانی توانایی زاوزێ ‹بر اثر مصرف برخی داروها عقیم شد: بە بۆنەی بەکار بردنی برێ دەواوە نەزۆک بوو› ٢. لە پیاوەتی کەوتن؛ هێلک بڕیان؛ لە دەست دانی توانایی منداڵدارکردن ٣. بە فشە دەرچوون؛ بەتاڵ بوونەوە ‹تلاش مخالفان عقیم شد: هەوڵی نەیاران بە فشە دەرچوو›.

**عقیم کردن:** ١. هەرکاندن؛ نەزۆک کردن؛ لە توانستی زاوزێ خستن ٢. بەتاڵ کردنەوە؛ بە فشە دەرکردن؛ بێ‌ئاکام کردن.

**عقیم گذاشتن:** بەتاڵ کردنەوە؛ لە کار خستن ‹فقر همەی تلاشهای او را برای تحصیل عقیم گذاشت: هەژاری هەموو هەوڵ و کۆشەکانی بۆ خوێندن بەتاڵ کردەوە›. هەروەها: **عقیم ماندن**

**عقیم‌سازی** / aqîmsāzî'/: [عربی/ فارسی]/اسم. کار و ڕەوتی بەرگری‌کردن لە زاوزێ گیاندارێک.

**عکاس** / akkās' ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. وێنەگر: ١. ئەو کەسە کاری گرتنی وێنەیە ‹دخترش عکاس است: کچەکەی وێنەگرە› ٢. ئەو کەسەی لە هونەری وێنەگریدا لێهاتووە.

**عکاسخانه** / akkāsxāne' ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. [قدیمی] وێنەگری؛ عەکاسی؛ کارگەی عەکاسی و وێنەگرتن.

**عکاسی** / akkāsî'/: [عربی]/اسم وێنەگری؛ عەکاسی: ١. کار و ڕەوتی وێنەگرتن ‹از منظرەی طبیعت عکاسی می‌کند: لە دیمەنی سروشت وێنەگری دەکا› ٢. کاری وێنەکێش ‹از عکاسی پول خوبی درمی‌آید: لە وێنەگری پارەیەکی باش دەردێ› ٣. ـها/ شوێنی وێنەگرتن؛ کارگەی وێنەگری ‹عکاسی بستە بود: وێنەگری داخرابوو›.

**عکس**[1] / aks' ، ـها/: [عربی]/اسم. وێنە؛ عەکس؛ ڕەسم: ١. وێنەیێ کە بە کامێرا گیراوە ٢. سوخەت؛ وێنەیێ کە لە سەر ڕووبەرێکی ڕوون یان بریکەدارەوە بەدی‌دێ ‹عکس درختان در آب افتادە بود: وێنەی دارەکان کەوتبووە سەر ئاوەکەوە› ٣. [مجازی] وێنەیێ کە بە کوپی، چاپ یان نیگارکێشی لە شتێ، پێک‌هاتووە.

▣ **عکس انداختن** ☜ **عکس گرفتن**

**عکس برداشتن** ☜ **عکسبرداری**

**عکس گرفتن:** وێنەگرتن؛ ڕەسم‌کێشان؛ وێنەی شتێک لە سەر فیلمی وێنەگری یان بە هەر شێوەیەکی تر تۆمار کردن ‹داشت تند و تند عکس می‌گرفت: خەریک بوو پەساپەس وێنەی دەگرت›: **عکس انداختن**

**عکس**[2]: صفت. پێچەوانە؛ بەرەواژ؛ بەراوەژوو؛ ئاوەژوو؛ بەرەڤاژ؛ پێچەوانەی شتێک لە باری پێکهاتە یان چۆنیەتیەوە ‹امروز حرفی می‌زد و فردا عکس آن را می‌گفت: ئەمڕۆ قسەیەکی دەکرد و بەیانی پیچەوانەکەی دەگوتەوە›.

**عکس‌العمل** / aksol'amal' ، ـها/: [از عربی]/اسم. کاردانەوە؛ بەرپەرچ؛ کاری بەرپەرچ دانەوە.

**عکسبرداری** / aksbardārî'/: [عربی/ فارسی]/اسم. وێنەگری؛ کار و ڕەوتی تۆمارکردنی وێنە لە سەر فیلم بۆ دەرهێنانی وێنە.

**عکس‌برگردان** / aksbargardān' ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. بەرگەردان؛ جۆرێک کاغەزی تایبەتە وێنەیەکیان خستۆتە سەری کە بە تەڕکردن، چەسپاندن، ماڵین (دەست پێدا هێنان) یان گەرم کردن، وێنە یان نووسراوەکەی لە سەر شوێنی پێویست بەجێ دەمێنێ.

**علائق** / alā'eq'/: [عربی] ☜ **علایق**

**علائم** / alā'em'/: [عربی] ☜ **علایم**

**علاج** / alāc, 'elāc' ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. چارە؛ چار؛ عیلاج؛ هاوڵ؛ هاویل ‹علاجش پول است: چارەی پارەیە› ٢. دەرمان؛ چارەسەر؛ چارەسەری ‹علاج ریزش مو: دەرمانی قژ وەرین›.

هەروەها: **علاج داشتن؛ علاج شدن؛ علاج کردن**

**علاف**[1] / allāf' / ، ـها؛ ـان/: [اعربی]/اسم. عەللاف؛ عەلاف؛ ئالیکفرۆش؛ کەسێک چیلکە و خەڵووز و کا و وێنجە دەفرۆشێ.

**علاف**[2]: صفت. [مجازی، گفتاری] سەرگەردان؛ عەللاف؛ ئەلاف؛ وێڵ؛ تووشیاری چاوەڕوانی و هاتوچۆی بێکەڵک ‹چهار ماه توی این شهر علاف شدم: چوار مانگ لەم شارە سەرگەردان بووم›.

هەروەها: **علاف بودن؛ علاف شدن؛ علاف کردن**

**علافی** / allāfī'/: [اعربی]/اسم. عەلافی: ١. کار و پیشەی عەللاف ٢. /ـها/ ئالیکفرۆشی؛ دووکان یان شوێنی کاری عەللاف ٣. /ـها/ [گفتاری] سەرگەردانی؛ وێڵی؛ بەتاڵپایی.

◘ **علافی کشیدن**: عەلاف بوون؛ سەرگەردان بوون؛ ماتڵ بوونی بێسوود.

**علاقمند** / alāqmand'/: (!) [عربی/ فارسی] ☜ **علاقەمند**

**علاقە** / alāqe' / ، ـها؛ علایق/: [اعربی]/اسم. ١. هۆگری؛ ئۆگری؛ هۆگرەتی؛ حەز؛ واز؛ هەز؛ شەوق؛ پەیوەندی؛ پەیوەن؛ پەیوەند؛ پێوەن؛ لاقە؛ قمشی ٢. دارایی و ملک و ماڵ.

◘ **علاقە داشتن**: واز لێ بوون؛ هۆگر/ ئۆگر بوون؛ حەز بوون؛ شەوق لە سەر شتێ بوون؛ ویستن؛ خۆش ویستن؛ دڵ پێوە بوون ‹خیلی به موسیقی علاقە داشت: زۆر وازی لە مۆسیقا بوو›.

**علاقەبند** / alāqeband' / ، ـها؛ ـان/: [اعربی/ فارسی] صفت. ١. قەزاز؛ زەنگیانەهۆن؛ هۆنەری وردە مووروو و زەنگیانە ٢. زەنگیانەفرۆش؛ فرۆشیاری خشل و زرق و برقی جلوبەرگ (وەک کلانە، پووڵەکە و...). هەروەها: **علاقەبندی**

**علاقەمند** / alaqemand' / ، ـها؛ ـان/: [اعربی/ فارسی] صفت. ١. دەربایست؛ دەربایس؛ دەربەست؛ دەربەستە؛ دەربەن؛ دەربەند؛ پابەند؛ پێبەند؛ بە گرینگ؛ گوێدەر بە کار ٢. ئۆگر؛ هۆگر؛ پابەند یان دڵبەستەی شتێ ‹علاقەمند به موسیقی: ئۆگری موسیقا› ٣. لایەنگر؛ لاگیر؛ خاوەن هۆگرەتی بە شتێ ‹علاقەمند به خوابیدن بود: لایەنگری خەوتن بوو› ❋ **علاقمند**

**علامات** / alāmāt'/: [اعربی] جمعِ ☜ **علامت**

**علامت** / alāmat' / ، ـها؛ علامات؛ علائم/: [اعربی]/اسم. نیشانە: ١. درۆشم؛ دورف؛ درف؛ هنارە؛ نیشان؛ هێما؛ هەوە؛ نیشانەی تایبەتی ‹عطسەی پیاپی علامت سرماخوردگی است: پژمەی لەسەریەک نیشانەی هەڵامەتە› ٢. نماد؛ نمانا ‹لبخند علامت دوستی است: بزە نیشانەی دۆستیە› ٣. [گفتاری] ئاڵا؛ ئاڵا؛ بەیاخ؛ بەیداخ؛ عەلەم؛ پەرچەم.

◘ **علامت دادن**: نیشاندانی درۆشم یان نیشانەیەک بۆ دەربڕینی بیر یان فرمانێک.

**علامت گذاشتن**: مۆر نان؛ شەقڵکردن؛ دیاری کردن؛ نیشانکردن؛ درۆشم دانان.

**علامتگذاری** / alāmatgozārī' / ، ـها/: [اعربی/ فارسی]/اسم. نیشانکاری؛ کار یان ڕەوتی نیشانە کردن؛ نیشانە دانان.

**علامە** / allāme' / ، ـها/: [اعربی]/اسم. هۆزان؛ زانایۆخ؛ فریەزان؛ فرەزان؛ زۆرزان؛ ئەوی زانیاری زۆر و زەبەندی لە هەموو بوارێکدا هەیە ‹علامە دهخدا: هۆزان دیهخودا›.

**علاوە** / alāve'/: [اعربی] صفت. زیادە؛ زیا.

◘ **علاوە بر این**: سەرەڕای ئەوە؛ سەرەڕای ئەمە؛ زیاد لەمە ‹علاوە بر این مقداری پول به او دادە شد: سەرەڕای ئەوەش بڕێ پارەی پێ درا›.

◘ **علاوە شدن**: پێزیاد بوون؛ زیا بوون؛ فرە بوون؛ هاتنە سەر ‹بعداً پنجاه نفر هم به جمعشان علاوە شد: دواتر پەنجا کەسیان پێ زیاد بوو›.

هەروەها: **علاوە کردن**

**علایق** / alāyeq'/: [اعربی] جمعِ ☜ **علاقە: علائق**

**علایم** / alāyem'/: [اعربی] جمعِ ☜ **علامت: علائم**

**علت** / ellat' / ، ـها؛ علل/: [اعربی]/اسم. هۆ؛ هاوا: ١. سەمەد؛ هجران؛ سۆنگە؛ هۆی کار یان دۆخێک ‹علّت دیر آمدن شما چیست؟: هۆی

دێرهاتنی ئێوه چیه؟› ٢. ئەوەی کە ئاکام یان داهاتێکی به دواوەیه ‹علت اصلی: هوی سەرەکی› ٣. کەس یان شتێ کە هۆکاری کردەوەیەکە یان شتێک بەدیدێنێت ‹نگهداری مواد آتش‌زا علت آتش‌سوزی بوده است: هەلگرتنی ماکی ئاگربەر هوی سووتمانەکە بووه› ٤. [مجازی] زەده؛ عەیب.

◘ **علت اصلی** ☜ **علت اولی**

**علت اولی**: هۆی سەرەکی؛ هۆیێ کە بەدیهێنەری هەموو سۆنگەکانی تره: **علت اصلی؛ علت‌العلل**

**علت‌العلل** /ellatolelal'/: [عربی] ☜ علّت اولی، علت

**علف** /alaf'، ـها؛ علوفه/: [عربی]/اسم. ئالف؛ ئالیک: ١. [گفتاری] لەوەڕ؛ سمەری؛ چێره؛ تفاق؛ لەوده؛ لۆده؛ واشه؛ ئاژاڵ؛ خۆراکی پاتاڵ و مالات ٢. [مجازی] گیا؛ گیواو؛ گژ و گیا ‹بیابان بی‌آب و علف: دەشتی وشک و بێ‌گیا› ٣. ئاژاڵ؛ ناوی گشتی بۆ دەستەیەکی گەوره لە گژ و گیای خۆڕسک و پتر یەک‌ساڵه که لاسکی چێوییان نیه.

◘ **علف بلادن**: ڕەزڵە؛ تووڵەزەڕە؛ ترێ‌مارانە؛ ڕووەکێکە لە کۆمەڵەی باینجان بە ڕەگی ئەستوور و گۆشتن، گوڵی پەمەیی مەیلەو زەرد، بەری سووری وەک ترێ کە ماکێکی سڕکەری تێدایە بۆ دەرمان بەکار دەچێ.

**علف بواسیر**: گای مایەسیری؛ گیاییێکی دەشتەکی بچووک، بە گەڵای وەک لەپی دەست و گوڵی زەردەوە، لە نزمانیدا دەڕوێ و ئاوی ڕەگەکەی بۆ نەخۆشی مایەسیری باشە.

**علف جالیز**: گیاکەڵە؛ گوڵە بێسان؛ بوومەترکە؛ بۆمترەکە؛ گیا کوژەک؛ گوڵەک؛ ڕووەکێکی مشەخۆره که ماکی کلۆروفیلی تێدا نیه، بەڵام گوڵ دەگرێت و بە ڕەگی ڕووەکانی‌ترەوە دەنووسێنێت و ئاوەکەیان دەمژێ.

**علف چشمه**: کووزەڵە؛ کویزەڵە؛ بەرگەمێ؛ بەریەمێ؛ بێزەروو؛ بێزروو؛ تەڕەتیزە کێویلە.

**علف خرس**: ١. گوێ‌ورچە؛ جۆزناق؛ ڕووەکی گەڵاگەورەیە بە گوڵی زەرد و هێشووئاساوە، تەمەنی درێژە و تایبەتی ناوچەی گەرمە، بۆ ئازاری جومگە و کۆکە و سەرما چاکە ٢. [مجازی] بەلاش؛ هەر شتێکی مشەی بێ‌بایەخ و لەبەردەست.

**علف شوره**: بەلۆچە؛ کەفکەفۆک؛ حوژە؛ ئەسپۆن؛ زروێ؛ زرۆ؛ گیاییێکە بە بنی سپیەوە دەکوترێ و لە جیاتی سابوون بەکاردێ.

**علف شیر**: گیاشیر؛ شیرگرسێن؛ گیا هەوێن؛ ئامیان پەنێر؛ سۆتیچکە؛ کەوڵە گیا؛ ڕۆناسە گیا؛ ڕووەکێک بە قەدی باریک و چەپکی، گەڵای درێژ و باریکەڵە و گوڵی وەک گوڵەگەنم، شیری هەیە و بۆ لەوەڕ باشە.

**علف گربه**: سمڵەتیف؛ گیاکتک؛ گیاکەتک؛ ئەشەدبۆ؛ ڕێخەداروو؛ ئاوڕێژەک؛ گیا بووندار؛ گیایەکی دەرمانە، پشیلە زۆر حەزی لە بۆنەکەیەتی.

**علف هرز**: هەرێز؛ ئالاخ؛ هەژاڵە؛ فریز؛ فریزوو؛ هەرێس؛ هەلیس؛ هەلیز؛ فرس؛ فرێز؛ فرووزوو؛ فرووزی؛ گیای بێ‌کەڵک کە دەبێ بژار بکرێ.

**علف هفت‌بند**: گیا گرێچک؛ گرێچکە؛ سیچکە؛ دووگوێ‌بەرخە؛ گیابژارێکی مەزرا و بێستانە بە لاسکی گرێ‌گرێ ڕەق و گەڵای ورد و ڕیشە و بنۆکی پتەو و قایمەوە.

◘ **علف زیر پای کسی سبز شدن**: [مجازی] کەسێ چەکەره دان؛ کەسێ چەکەره دەرکردن؛ چاوەڕوانی و تەمای زۆر و بێ‌هۆکردن ‹آن‌قدر بایست تا علف زیر پایت سبز شود: ئەوەندە ڕاوەستە تا چەکەره بدەی›.

**علف‌چر** /alafčar'، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. لەوەڕگە؛ لەوەڕگا؛ ئالفجاڕ؛ فرێزە؛ پەرێز؛ چایەر ‹گوسفندها را برده بود علف‌چر: پەزەکانی بردبووه

لەوەرکە›.

**علف‌چینی** / 'alafčînî/: [عربی/ فارسی]/اسم. کۆکەن؛ کار و ڕەوتی گیا چنین؛ گیا دوورین؛ بڕین و باقەکردنی ئالف ‹فردا برویم علف‌چینی: بەیانی بڕۆین بۆ کوکەن›.

**علفخوار** / 'alafxār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. گیاخۆر؛ ئالفخۆر؛ بە تایبەتمەندی دابین بوونی پێخۆر لە ئالف.

**علفدان** / 'alafdān، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. مەرەک؛ لەوەڕدان؛ تفاقدان.

**علفزار** / 'alafzār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئالفجاڕ؛ گیاجاڕ؛ گیازار؛ لەوەڕگا؛ لەوەڕگە؛ لۆجاڕ؛ چیم؛ چێرگە؛ چایەر؛ وشکەپەل؛ جاڕەگیای خۆڕسک.

▣ **علفزار بی‌آب**: بوویش؛ زەمەند و قشلاقی بێئاو.

**علف‌کش** / 'alafkoš، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پێبژار؛ دەوابژار؛ گیاکوژ؛ هەر جۆرە ماک یان ئامرازێک بۆ لە ناو بردنی گژ و گیای بژار.

**علفی** / 'alafî/: [عربی] صفت. ئالفی؛ ئالیکی: ١. سەرین؛ وەکوو ئالف ٢. سەرین؛ لە جنسی ئالف ٣. *[گیاەشناسی]* پووشینە؛ کەم تەمەن و بەبێ ئەندامی ڕەق و چێوی ٤. *[گفتاری]* ئالفخۆر؛ گیاخۆر.

**علقەمضغە** / 'alaqemozqe/: [عربی] صفت. *[مجازی]* پووت؛ پووتە؛ پووتەک؛ پووتەکە؛ مەلەمیزە؛ مەلەمیسە؛ ڕەق‌وتەق؛ بەرچاوتەنگەر و بێنموت.

**علل** / 'elal/: [عربی] جمعِ ☜ **علت**

**علم**[1] / 'alam، ـها/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* ئالا؛ بەیاخ؛ بەیداخ؛ بەندێر؛ کۆتەڵ؛ پەرچەم؛ عەلەم.

▣ **علم کردن**: دامەزراندن؛ بەرپا کردن: ١. هەڵدان؛ داکوتان؛ هەڵداشتن؛ هەڵواسین؛ شەکاوەکردن؛ هۆردەی؛ هۆردای ‹چادر را علم کردیم: چادرەکەمان هەڵدا› ٢. سازکردن؛ وناردن؛ داچنین؛ تەیار و ئامادەکردن ‹بساط چای را علم کردند: پساتی چایان دامەزراند›.

هەروەها: **علم شدن**

**زیر علم کسی سینه زدن**: *[تعریض]* بلەـبلەی کەسێ کردن؛ خۆماڵەـخۆماڵە بۆ کەسێ وتن؛ بە ساز کەسێ سەما کردن؛ شوێنی کەسێ کەوتن و پشتیوانی لێ‌کردنی.

**علم**[2]: صفت. ناسراو؛ ناودار؛ بەناو ‹اسم علم: ناوی ناسراو›.

**علم** / 'elm، ـها؛ علوم/: [عربی]/اسم. زانست؛ زانس؛ زانیاری: ١. زانایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی زانین ‹دربارەی موضوعی کە نسبت بە آن علم کافی نداریم، نباید حرف بزنیم: سەبارەت بە بابەتێ کە زانستی ئەوتۆمان لێی نیە، نابێ بدوێین› ٢. بەشێ لە زانیاریگەلی ڕێکخراو وەکوو لقی خوێندن ‹علم زمین‌شناسی: زانستی زەویناسی› ٣. ڕێ‌وشوێن؛ داب؛ ئەوی بشێ وەک ئاگاییێکی هەموانی فێری بین یان لە ڕێخراوەیەکدا بگوترێتەوە ‹علم معاش: زانستی ژیان›.

▣ **علم اجتماع**: کۆمەڵناسی؛ کۆمەڵگاناسی؛ زانستێ کە لە تایبەتمەندی کۆمەڵەگەلی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە.

**علم اخلاق**: ئاکارناسی؛ زانستی لێکدانەوەی فەلسەفی بابەتگەلێکی وەک چاکە و خراپە، دروستی و نادروستی ماف و ئەرک.

**علم اصوات**: دەنگ‌ناسی؛ فونێتیک؛ زانستی لێکۆڵینەوە و ڕیزبەندی دەنگەکانی زمانێ یان برێ لە زمانگەل.

**علم اصول**: زانیاری سەر بە بنەماگەلی فیقهی کە بە دەستی گەورەکانی دین دانراوە.

**علم الهی**: خواناسی؛ زانیاریگەلی سەر بە ئامۆژەی دینی یان دینێکی تایبەت، سەبارەت بە خوو و ئافراندن.

**علم غیب**: عیلمی غەیب؛ پیوارناسی؛ ئاگەداری لە ڕازگەلی نهێنی و ئەوەی لە خەلک پیوارە.

**علم کلام**: زانستی کەلام؛ زانینێ کە لە سەر بنەمای بەڵگەی ئەقڵی، لاگری لە ئامۆژەی دینی دەکا.

**علم لَدُنّی**: زانستی لە خواوە؛ زانستێ کە لە دەروونی کەسێکدا خولقاوە و لە کەسێکەوە فێر نەبووە.

**علم نجوم**: ئەستێرەناسی؛ زانستی دۆزینەوە و لێکدانەوەی تەنگەلی ئاسمانی.

**علم نفس**: دەروونناسی؛ ڕەوانناسی؛ زانستی ناسین و لێکدانەوەی دیاردە و کارکردگەلی دەروونی.

**علم وراثت**: ژینیتیک؛ زانستێ کە لە سەر دیاردەی وەراسەت، هۆکارگەلی ئێرسی و شوێنەواریان دەکۆڵێتەوە.

**علما** / 'olamā/: [عربی] جمعِ ☜ **عالم**

**علم الاشیا** / 'elmol'ašyā/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* دیاردەناسی؛ زانستی دیاردەگەلی سروشتی؛ زانستێ کە لە سەر ڕووداو و دیاردەگەلی سروشتی دەکۆڵێتەوە.

**علمدار** / 'alamdār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[قدیمی]* ئاڵاهەڵگر؛ ئاڵاگر؛ پەرچەمدار؛ هەڵگری ئاڵا.

**علـمدوش** / 'alamdûš/: [عربی/ فارسی] ☜ **علمک ـ۲**

**علم‌شنگه** / 'alamšange/: [؟] ☜ **آلم‌شنگه**

**علمک** / 'alamak، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ۱. عەلەم؛ لوولەیەکی ئەستوونی لە دەریماڵەوە کە بە تۆڕی گازی شاریەوەیە و شێر و ڕێگلاتۆری لە سەرە ۲. لوولەی چەماوەی دووشی حەمام: **علم دوش**

**علمی** / 'elmî/: [عربی] صفت. زانستی؛ زانسی؛ پێوەندیدار یان سەر بە زانستەوە ‹همایش علمی: کۆ بوونەوەی زانستی›: **علمیّه**

**علمیه** / 'elmîyye/: [عربی] ☜ **علمی**

**علناً** / 'alanan/: [عربی] قید. ئاشکرا؛ بەئاشکرا؛ ئاشکار؛ ڕاشکاوانە؛ بە ڕاشکاوی؛ سوور ـ سوور؛ ڕوون؛ بەپانەوە؛ بەبێ دزە و قایمکاری ‹علنا دزدی می‌کرد: ئاشکرا دزی دەکرد›.

**علنی** / 'alanî/: [عربی] صفت. ئاشکرا؛ ڕاشکاو؛ بەرچاو و بەبێ شاردنەوە ‹جلسەی علنی: دانیشتنی ئاشکرا›.

**علو** / 'olov(v)/: [عربی]/اسم. بەرزی؛ بڵیندی؛ هەڤیازی ‹علو مقام: بەرزی جێگا›.

**علوفه** / 'olûfe, 'ulûfe/: [عربی] جمعِ ☜ **علف**

**علوم** / 'olûm, 'ulûm/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **علم** ۲. زانست؛ سەرجەمی زانستگەلی ئەزموونی.

▣ **علوم آزمایشگاهی**: زانستی ئەزموونگەیی؛ بنەما، شێواز و زانیاریگەلی سەبارەت بە چۆنیەتی ئەنجامدانی ئەزموونگەلی بژیشکی.

**علوم اجتماعی**: زانستی کۆمەڵایەتی؛ زانستێ کە لە سەر بنکە و کردەوەگەلی کۆمەڵگایی مرۆڤ دەکۆڵێتەوە (وەک زانستی ئابووری و خەلکناسی).

**علوم اداری**: زانستی کارگێڕی/ مەزرینگەیی؛ زانست و زانیاری لەمەڕ پێکهاتە، چالاکی و شێوەگەلی بەڕێوەبەرایەتی لە ڕێخراوەی کارگێڕیدا.

**علوم ادبی**: زانستی وێژە و وێژەوانی.

**علوم انسانی**: ئەو زانستانە کە لە سەر خولقاوەکانی بیر و هزری مرۆ دەکۆڵنەوە (وەک فەلسەفە، ئاکار یان زمان).

**علوم پایه**: زانستی بنەمایی؛ لقە سەرەکیەکانی زانست کە بنەمای زانستگەلیترن، وەک فیزیک، کیمیا و بیرکاری.

**علوم پزشکی**: زانستی بژیشکی؛ زانست، شێواز و بنەماگەلی سەر بە ناسین، دەرمان و بەرگری لە نەخۆشی.

**علوم تجربی**: زانستی ئەزموونی؛ زانستێ کە بابەتەکانی بە پێی ئەزموون و تاقیکردنەوەیە.

**علوم خفیه**: زانستی شاراوه؛ کۆی زانیاری و بنەما و شێوەگەلی غەیب‌بێژی، لێکدانەوەی خەو، جادوو و... : **علوم غریبه**

**علوم دینی**: زانستی دینی؛ کۆمەڵە زانیاری و بنەماگەلی سەر بە ناسینی دین، بایەخگەلی دینی، بەندایەتی، قانوونی شەرع، ژیان و ئامۆژگاری گەورەگەلی دین.

**علوم رفتاری**: زانستی کردەوەیی؛ زانستێ کە لە هاندەر و هۆی کردەوەی گیانەوەران دەکۆڵێتەوە.

**علوم ریاضی**: زانستی بیرکاری/ ڕیازی.

**علوم زیستی**: ژیناسی؛ ژینەوەرناسی؛ زانستی ناسین، ڕیزبەندی و تۆژینەوەی ژیانی ژینەوەران.

**علوم سیاسی**: زانستی سیاسی/ ڕامیاری؛ سەرجەمی بنەما و زانیاری سەر بە ڕژیمگەلی سیاسی، ماف و پێوەندی نێو گەلان.

**علوم طبیعی**: زانستی سروشتی؛ زانست و زانیاریگەلی سەر بە سروشت (وەک ژینەوەرناسی، زەویناسی و...).

**علوم عقلی**: زانستی بیرمەندی؛ ئەو زانست و زانیاریانە کە دەپەرژێتە سەر بەڵگە هێنانەوە و تێڕامان: **علوم معقول**

علوم غریبه ☜ **علوم خفیه**

**علوم کاربردی**: ئەو زانستانە کە زۆرتر دەپەرژێنە سەر باری لێزانی کارەوە (وەک ئەندازیاری، بژیشکی و...).

علوم معقول ☜ **علوم عقلی**

علوم منقول ☜ **علوم نقلی**

**علوم مهندسی**: زانستی ئەندازیاری؛ زانست، بنەما و زانیاریگەلی سەر بە پیشەسازی، نەخشەکێشی و پێکهاتەی ماشێن و ئامراز و کەرستە و بەکار هێنان و بەرهەمەکانیان.

**علوم نقلی**: بنەما و زانیاریگەلێ کە لە ڕابردوانەوە ماوەتەوە (وەک حەدیس، مێژوو و...): **علوم منقول**

**علوی** / 'alavî/: [عربی] *صفت*. عەلەوی: ۱. سەر بە حەزرەتی عەلی ۲. /ـها؛ ـان/ لە وەچ و بەرەی حەزرەتی عەلی.

**علوی** / 'elvî/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ئاسمانی؛ بانی؛ بالایی؛ سەروویی؛ ژوورگ؛ سەر بە ژوورەوە.

**علی** / 'ellî/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ۱. هۆیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە هۆوە ۲. هۆدار؛ بەهۆ؛ خاوەن هۆ.

**علیا** / 'olyā/: [عربی] *صفت*. سەروو؛ سەری؛ ژووروو؛ ژوورگ؛ ژووڕنگ؛ جێگرتوو لە لای ژوورینەوە ‹میرآباد علیا: میراوای سەروو›.

**علیاحضرت** / 'olyāhazrat، ـها/: [عربی] *اسم*. ڕێزناوێ بۆ شاژن، ژن یان دایکی شا.

**علی‌الاتصال** / 'alal'ettesāl/: [عربی] *قید. [ادبی]* بێ‌بڕانەوە؛ لە سەر یەک؛ یەک لە دووی یەک؛ وە شۆن یەکا؛ پشت سەر یەک؛ سەرمڕ؛ سەرەمڕ؛ بەردەوام؛ لێکدالێکدا؛ شوێن‌بەشوێن ‹سه روز تمام علی‌الاتصال می‌بارید: سێ ڕۆژی تەواو بێ‌بڕانەوە دەباری›.

**علی‌الاجمال** / 'alal'ecmāl/: [عربی] *قید*. بە کورتی؛ کورت و کرمانجی ‹علی‌الاجمال وضع را تشریح کرد: بە کورتی بار و دۆخەکەی لێکدایەوە›.

**علی‌الاحتیاط** / 'alal'ehtîyāt/: [عربی] *قید*. بۆ دڵنیایی؛ بۆ دڵقایمی؛ بۆ متمانە ‹علی‌الاحتیاط پول بیشتری بردار: بۆ دڵنیایی پارەیەکی زۆرتر هەڵگرە›.

**علی‌الاصول** / 'alal'osûl, -'usûl/: [عربی] *قید*. لە بنەڕەتدا؛ لە بناغەوە؛ لە بنەڕەتەوە؛ بنەڕەتەنە ‹علی‌الاصول این کار درست نیست: ئەم کارە لە بنەڕەتدا دروست نیە›.

**علی‌الاطلاق** / 'alal'etlāq/: [عربی] *قید*. بەبێ‌قسە؛ بێ‌قرە؛ بەبێ سێ و دوو.

**علی‌البدل** / 'alalbadal/: [عربی] *صفت*. جێگر؛ جێ‌نشین ‹عضو علی‌البدل: ئەندامی جێگر›.

**علی‌التحقیق** / alattahqîq'/: [عربی] *قید.* به جوانی؛ به دروستی؛ به ڕاستی؛ لە ڕاستیدا؛ لەڕاسیا؛ ڕاسەکەی؛ ڕاستیەکەی؛ ڕاسیەکەی؛ لە ڕووی توێژینەوە و ڕاستیەوە ‹علی‌التحقیق معلوم شد حق با اوست: به جوانی دەرکەوت کە حەق بەوە›.

**علی‌الحساب** / alalhesāb'/: [عربی] *قید.* لە سەر حیساب؛ به شێوەی بەشێ لە حسێو (وەک قەرز، مز و...).

**علی‌الخصوص** / alalxusûs, 'alalxosûs'/: [عربی] *قید.* بەتایبەت ‹علی‌الخصوص از شما گله داشت: بەتایبەت گلەیی لە ئێوە هەبوو›.

**علی‌الدوام** / aladdavām'/: [عربی] *قید.* بێ‌وچان؛ یەکسەر؛ یەکسەرە؛ بەردەوام؛ دایمە و دەرهەم؛ لە سەر یەک؛ بە دووی یەکدا ‹علی‌الدوام تا صبح می‌نوشت: بێ‌وچان هەتا بەیان دەینووسی›.

**علی‌الرسم** / alarrasm'/: [عربی] *قید.* بە پێ داب و نەریت؛ بە پێی داب؛ بە گوێرەی داب؛ بە گوێرەی ڕەسم؛ وا کە باوە ‹علی‌الرسم باید به دیدنش برویم: بێ پێی داب و نەریت دەبێ بڕۆین بۆ لای›.

**علی‌السویه** / alassavîyye'/: [عربی] *قید.* وەکوو یەک؛ وەک یەک؛ یەکسان؛ پێسەو یۆی؛ بەبێ جیاوازی ‹بودن و نبودنش برایم علی‌السویه است: بوون و نەبوونی بۆم وەکوو یەکە›.

**علی‌الصباح** / alassabāh'/: [عربی] *قید.* سەر لە بەیان؛ بەربەیان؛ لە کاتی بەیاندا؛ لە بەرە بەیاندا؛ پێش گزنگ ‹علی‌الصباح راه افتادیم: سەر لە بەیان کەوتینە ڕێ›.

**علی‌الطلوع** / alattulû', 'alattolû''/: [عربی] *قید.* خۆرکەوتنان؛ خۆرکەوتن؛ خوەرکەفتن؛ گزنگ دان؛ لە کاتی هەڵاتنی ڕۆژدا؛ لە کاتی خۆر کەوتندا ‹صبح علی‌الطلوع به شهر رسیدیم: بەیانی خۆرکەوتنان گەیشتینە شار›.

**علی‌الظاهر** / alazzāher'/: [عربی] *قید.* وا دیارە؛ وەک‌دیارە؛ بە ڕواڵەت؛ پاسە دیارە ‹علی‌الظاهر باید شب را در آنجا بگذرانیم: وا دیارە دەبێ شەو لەوێ بەرینە سەر›.

**علی‌الله** / alallāh'/: [عربی] *دعا. [گفتاری]* لە سەر خودا؛ تەوەکول بە خوا ‹علی‌الله برویم، ببینیم چه می‌شود: لە سەرخودا بڕۆین بزانین چ دەبێ›.

**علیامخدرات** / olyāmoxaddarāt'/: [عربی] جمعِ ☜ **علیامخدره**

**علیامخدره** / olyāmoxaddare'، علیامخدرات/: [عربی] *اسم. [قدیمی]* خاتوون؛ خاتوو؛ خات؛ ڕێزناوێکی ژنانە.

**علی‌ای‌حال** / alā'ayyohāl'/: [عربی] *حرف.* بە هەرحاڵ؛ وە هەرحاڵ؛ هەرچۆنێک بێ ‹علی‌ای‌حال اگر از تو چیزی پرسیدند، راستش را بگو: بە هەرحاڵ شتێکیان لێت پرسی ڕاستیەکەی بڵێ›.

**علیت** / ellîyyat'/: [عربی] *اسم.* ۱. هۆیەتی؛ پێوەندی نێوانی هۆ و بەرهۆ ۲. پێوەندی نێوان هۆکارێک لەگەڵ ئەو ڕووداو و دیاردەیانە بە دوویدا دێن.

**علی‌حده**[1] / alāhadde, 'alāhedde'/: [عربی] *صفت.* جیاواز؛ جیاکار؛ تایبەتی ‹هر کدام اتاق علی‌حده داشتند: هەر کام دیوێکی جیاوازیان هەبوو›.

**علی‌حده**[2]: *قید.* بەجیا؛ جیا؛ جیاواز؛ جیاییانە؛ جیا‌ـ‌جیا؛ بە شێوەی جیاواز ‹از هر یک علی‌حده احوالپرسی کرد: لە هەرکام بە جیا هەواڵپرسی کرد›.

**علی‌رغم** / alāraqme'/: [عربی] *حرف.* پێچەوانە؛ بە پێچەوانە؛ لە دژی ‹علی‌رغم میل او رفتار می‌کرد: پێچەوانەی ویستی ئەو دەجووڵاوە›.

**علیق** / alîq'/: [عربی] *اسم.* ئالیک؛ ئالک؛ ئیم؛ یێم؛ ئێم؛ کا و جۆ؛ عەلیق؛ پێخۆری ئاژەڵان.

**علیک** / aleyk'/: [عربی] *دعا. [گفتاری]* عەلەیک؛ وەرامی سەلام و چاک و خۆشی.

**علیک‌الاسلام** / aleykassalām, 'aleyke-'/: [عربی] *دعا. [گفتاری]* عەلەیکەسەلام/ سلام؛ سڵاو بۆ تۆ/ لە خۆت.

**علیکم‌السلام** /'aleykomassalām, 'aleykomo-/: [عربی] دعا. سلاو لە خۆتان/ بۆ ئێوە؛ عەلەیکمەسەلام (تێبینی: لە وەرامی سەلامدا دەگوترێ).

**علیل** / alîl': [عربی] صفت. ۱. سەکەت؛ سەقەت؛ گەزنگاز؛ زەدە (بۆ ئەندامی لەش) ۲. ڕەنجاو؛ داماو؛ داماگ؛ داکەوتوو.

**علی‌موجود** / alîmowcûd, -mo:cûd': [عربی] اسم. [گفتاری] مەشاک؛ عاسا؛ گۆچان؛ داردەستی دەروێشان.

**علی‌ورجه** / alîvarce'، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ۱. [قدیمی] لەیستۆکێک بە شێوەی پەیکەر یان وێنەی کوڕێ پەتێک بە پشتیەوە بەسرابوو کە پەتەکەیان دەکێشا، دەست و پێی دەجوولاوە ۲. [مجازی] بزۆز؛ هار و هاج؛ جرت و فرت کەر؛ کەسێ کە زۆر جم و جوول دەکا ۳. مێرووی لە تیرەی کولە و سیسرک کە بە بازدان دەڕوا.

**علیه** / aleyhe': [عربی] حرف. دژ بە؛ دژ؛ لە دژ ‹علیه کسی حرف زدن: دژ بە یەکێ قسەکردن›.

**علیه‌السلام** / aleyhessalām, 'aleyha-': [عربی] دعا. سلاوی لێ بێ (تێبینی: سارستەیێ کە پاش ناو بردن لە پێغەمبەران و گەورەپیاوانی ئایینی دێتە سەر زار).

**علی‌هذا** / alāhāzā': [عربی] حرف. لەو ڕووەوە؛ کەوابوو؛ سا؛ دەیسا؛ دەسا ‹علی‌هذا باید هوشیار باشیم: کەوابوو دەبێ وشیار بین›.

**عم** / am(m)': [عربی] ☜ **عمو**

**عمارات** / emārāt': [عربی] جمعِ ☜ **عمارت**

**عمارت** / emārat'، ـها؛ عمارات/: [عربی]/اسم. باڵەخانە؛ تەلار؛ ئابیدە؛ ماڵ؛ عەمارەت؛ خانوبەرەی زل و بلیند.

**عمّاقریب** / ammanqarîb': [عربی] قید. بەم زوانە؛ بەزوویی؛ ئیسە و تاوێتر؛ بە زووترین کات؛ بەم زوویانە/ نزیکانە ‹عمّاقریب مهمانها می‌رسند: بەم زوانە میوانەکان دەگەن›.

**عمال** / ommāl': [عربی] جمعِ ☜ **عامل**

**عمامه** / ammāme'، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. /عمایم/ مێزەر؛ مێزەرە؛ مەیزەر؛ پێچ؛ سەرپێچ؛ سەروپێچ؛ پێچ و مێزەر؛ کەشیدە؛ شاش؛ شاشیک؛ شاشک؛ مەندیل؛ پووتک؛ ئەردی؛ کلاولەچک؛ مشکی؛ سەروێن؛ پۆشی؛ عەمامە؛ پارچەیەکی درێژە کە لە وڵاتانی ئیسلامیدا، بەتایبەت مەلایان بە سەریانەوە دەبەستن ۲. گولۆلە بەنێ کە وەک مێزەرە (چەپ و ڕاست) بە دەور گلیلێکدا ئالاوە.

**عمایم** / amāyem': [عربی] جمعِ ☜ **عمّامه**

**عمد**[1] / amd': [عربی]/اسم. قەستی؛ بەبڕیار؛ دەسمەبەست؛ دەسانقەسی ‹اقدام او از روی عمد بود: ئەو کارەی قەستی بوو›.

**عمد**[2]: صفت. بە قەستی؛ دەسانقەس؛ دەسەنقەس؛ بەتایبەتی؛ بە دەستی ئەنقەست ‹قتل عمد: کوشتنی بەقەستی›.

**عمداً** / amdan': [عربی] قید. قەستی؛ دەستی؛ دەسی؛ قەسە؛ وەقەسی؛ بە قەستی؛ دەسانقەست؛ دەستانقەست؛ دەسانقەس؛ دەسقەس؛ دەقەس؛ ئەنقەس؛ ئەنقەست؛ ئانقەست؛ دەسمەبەست؛ ژدل؛ حەمون؛ بە ویست و زانینەوە ‹عمداً شیشه را شکست: قەستی شیشەکەی شکاند›.

**عمدتاً** / omdatan': [عربی] قید. زۆرتر؛ زیاتر؛ زێدەتر؛ پتر؛ بەزۆری؛ فرەتر؛ فرەتەر ‹عمدتاً از آنجا خرید می‌کردیم: زۆرتر لەوێ شتمان دەکڕێ›.

**عمده** / omde': [عربی] صفت. زەبەند؛ بۆش؛ بەکۆ؛ کۆ؛ کۆم؛ بە چەند و چۆنیەکی زۆرەوە ‹صادرات عمده: هەناردەی زەبەند›.

**عمده‌فروشی** / omdefurûši': [عربی/ فارسی] اسم. کۆفرۆشی؛ کۆمفرۆشی: ۱. کار و ڕەوتی فرۆشتن لە قەبارەیێکی زۆردا. هەروەها: **عمده‌فروش** ۲. /ـها/ شوێنێک کە کاڵای تێدا بە کۆ دەفرۆشن.

**عمـــدی** / 'amdî/: [عربـــی] *صـــفت.* قەســـتی؛ دەسانقەســی؛ دەسەنقەســی؛ دەســتی؛ دەســی؛ دەسنەقەســی؛ دەسقەســی ‹کـم‌کـاری عمـدی: کەمکاری قەستی›.

**عمر** / 'omr/: [عربی] *اسم.* عومر؛ تەمەن: ١. *ـها/* ژیان؛ تامان؛ ماوەی ژیان ‹عمر کردن: ژیان بردنـە سـەر› ٢. تامـان؛ درێژایـی تەمــەن ‹عمـر دراز: تەمەنـی درێـژ› ٣. *[مجازی]* بـڕ؛ بەرگـە؛ مـاوەی وەک خۆی مانەوە یان بەکەڵک بوون ‹این کفشها دو ماه عمر نمی‌کند: ئەو کەوشە دوو مانگ بڕ ناکا›.

▣ **عمر خود را به کسی دادن:** *[مجازی]* عـومری خۆ بە کەسێ دان؛ بەر لە کەسێ مردن ‹پـدرم عمرش را داد به شما: باوکم عومری دا به ئێوه›.

**عمـر خـود را کـردن:** عـەمری خـۆ کـردن: ١. بەشی خۆ ساڵ لە خـوا سـاندن/ سـەندن؛ ژیانی ئاسایی و دڵخواز کردن ‹پدرش هشتاد و دو سال داشت و دیگر عمر خـود را کـرده بـود: بـابی هەشتا و دوو ساڵی هەبوو، بەشی خۆی ساڵی لـە خودا ساندبوو› ٢. کۆن بوون و لە کار کەوتن.

**عمر کردن:** ١. ژیان؛ ژیوای؛ ژین بردنـە سـەر ٢. بەرگەگرتن؛ دەوام هێنان؛ هەڵکردن.

**عمر کسی وفا نکردن:** عـەمری کەسـێک پێـوە نەمان؛ ڕۆح دەرنەبردن؛ ڕێواسـی ساڵـێکی‌تـر نەخواردن؛ زیندوو نەمان.

**عمراً** / 'omran/: [عربـی] *قیـد.* *[گفتـاری]* هـەرگیز؛ هەرگیزاوهەرگیز؛ بە هیچ شـێوەیەک/ کلۆجـێ؛ قەت؛ قەت‌ـقەت.

**عمـران** / 'omrān/: [عربـی] *اسـم.* ١. ئـاوەدانی؛ ئاوانی؛ ئاوەیانی ‹عمران روستاها: ئاوەدانی دێهـات› ٢. ☜ مهندسی عمران، **مهندسی**

**عمرانی** / 'omrānî/: [عربی] *صفت.* ئاوەدانکـاری؛ ئاوانکاری؛ ئاوەدانی؛ ئاوانی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ئاوەدان‌کردنەوەوە ‹برنامەی عمرانـی: بەرنامـەی ئاوەدانکاری›.

**عمر و زید** / 'amr-o-zeyd/: [عربی] *ضمیر.* *[ادبـی]* ئەم و ئەو؛ کەسانی دیاری نەکراو و بێ‌بایەخ ‹مـا بە تو مشغول و تو به عمر و زید: من دڵم لای تۆیە تـۆ لای ئەم و ئەو›.

**عمـره** / 'omre/: [عربـی] *اسـم.* عـەمرە؛ عـومرە: ١. سەرجەمی ئەو کارانە کە حاجیان لە حەجـدا دەیکەن (وەک بەسـتنی ئیحـرام، تـەواف، ڕەفـتی سەفا و مـەروە و سەرتاشـین) ٢. حـەج نـەک لـە کاتی خۆیدا.

**عمـــری**[1] / 'omrî/: [عربـــی] *صـــفت.* *[گفتـــاری]* هەمیشەیی؛ زۆر دەوامدار؛ بە درێژایـی تەمـەنی کەسێک ‹ساعتی به تـو مـی‌دهـم کـه عمـری باشـد: سەعاتێکت دەدەمێ هەمیشەیی بێ›.

**عمری**[2]: *قید.* بۆ هەمیشە؛ هەمیشەیی؛ بـە دەوام؛ بە درێژی عومرێک ‹عمری کار می‌کند: بو هەمیشـە کار دەکا›.

**عمق** / 'omq، ـها؛ اعماق/: [عربی] *اسم.* بـن؛ نـاخ؛ قووڵایی: ١. قویلی؛ قووڵی؛ کووری؛ نـق؛ چاڵـی ‹عمق آب: بنـی ئـاو› ٢. بـێخ؛ نـاوەڕۆک؛ بەشـی ناوەوە یان دەروونی شوێنێک ‹عمـق غـار: بیخـی ئەشـکەوت› ٣. بەشـی سـەرەکی، ڕاسـتەقینە و داپۆشراوی شـتێ ‹آن روز بـود کـه عمـق فاجعـه را دریـافتم: ئـەو ڕۆژە بـوو کـە لـە نـاخی کارەساتەکە تێگەیشتم›.

**عمقـزی** / 'amqezî، ـهـا/: [عربـی/ ترکـی] *اسـم.* *[گفتـاری]* کچەمام؛ کچی مـام؛ دوتـمـام؛ کـناچۆ مامۆی.

**عمق‌سنج** / 'omqsanc، ـها/: [عربی/ فارسـی] *اسـم.* ناخپێو؛ قووڵایی‌پێو: **ژرفاسنج**

**عمقلی** / 'amoqlî, 'amqolî/: [عربی/ ترکـی] ☜ **عمواوغلی**

**عمقی** / 'omqî/: [عربـی] *صفت.* قووڵـی؛ نـاخی؛ قـووڵ یـان لـە قووڵاییـدا ‹بـرش عمقـی: بڕشـتی قووڵی›.

**عمق‌یاب** / 'omqyāb، ـها/: [عربـی/ فارسـی] *اسـم.* ناخدۆز. هەروەها: **عمق‌یابی**

**عمل** / 'amal/: [عربی]/اسم. ١. /ـها: اعمال/ کار؛ هەرمان؛ هەرمانە؛ شوول؛ فرمان؛ ئیش؛ گورە؛ گوروە ‹عمل کردن: کار کردن› ٢. /ـها/ گوشار؛ هێزێ کە شتێ دەیخاتە سەر شتێکی‌تر ‹جای عمل دست روی فرمان: جێ گوشاری دەست بە سەر فەرمانەوە›. ٣. /ـها: اعمال؛ عملیات/ هەر کام لە ڕەوتانەگەلی بیرکاری بۆ بە دەست هێنانی چەنێتیەک لە چەنێتیگەلی‌تر ٤. /ـها: اعمال/ برینکاری؛ برینگاری؛ نژداری؛ عەمەل؛ عەمەلیات؛ نشتەرکاری؛ نشتەرگەری ‹قرار است پایش را عمل بکنند: بڕیارە پای برینکاری بکەن› ٥. /ـها: اعمال/ کار؛ ئیش.

▣ **عمل جراحی**: نژداری؛ برینکاری؛ نشتەرکاری؛ عەمەل؛ عەمەلیات.

**عمل جنسی**: عیلاقە؛ هاوباوەشی؛ کار و ڕەوتی جووت بوونی نێر و مێ.

**عمل خیر**: دزگوون؛ کاری باش/ چاک/ خێر.

**عمل منافی عفت**: کاری بێ‌ناموسی؛ شوالْ‌چەپەڵی.

▣ **عمل آمدن**: هاتنەکار: ١. دروست بوون؛ پێکهاتن؛ بەرهەم هاتن؛ بە عەمەل هاتن ٢. پەروەردە بوون؛ بارهاتن؛ بوون ‹در این زمین گوجەفرنگی خوب عمل می‌آید: لەم زەوینەدا تەماتەی باش دێتە کار› ٣. بارهاتن؛ گەیشتن؛ گەیین. هەروەها: **عمل آوردن**

**عمل کردن**: ١. بەجێ‌هێنان؛ کردنی کارێ بە پێی ڕێسا و بنەمای دیاریکراو ٢. کارکردن؛ کەوتنە کار ‹مینِ کارگذاشته شده عمل نکرد: مینە دانراوەکە کاری نەکرد› ٣. عەمەلْ کردن؛ نەشتەرگەری کردن ‹چشمش را عمل کردند: چاویان نژداری کرد›.

**به عمل آمدن**: ١. بە ئەنجام گەیشتن؛ کردن؛ بەڕێوە چوون ٢. ئامادە بوون؛ سازکران؛ هاتنە کار؛ گەورە بوون؛ بە کەڵک هاتن؛ هاتنە عەمەل.

**عملاً** / 'amalan/: [عربی]قید. ١. لە کاردا؛ لە ناو کارا؛ لە کاتی بەڕێوە چووندا ‹تکنیک‌ها را باید عملاً یاد گرفت: ڕێکارەکان دەبێ لە کاردا فێر ببێ› ٢. لە ڕاستیدا؛ ئەوەی ڕاستی بێ ‹عملاً او هیچکاره است: لە ڕاستیدا هیچ‌کارەیە› ٣. لە کاردا؛ لە باری چلۆن کارکردنەوە ‹عملاً کارش خوب است: لە کاردا زۆر باشە›.

**عملجات** / 'amalecāt/: [عربی/ از عربی] جمعِ ☜ **عمله**

**عملکرد** / 'amalkard,-kerd، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. کارکرد؛ کارکۆ؛ ئاکامی کردەوە ‹عملکرد سالیانەی شرکت: کارکۆی ساڵانەی شیرکەت›.

**عملگر** / 'amalgar، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. کاربەر؛ ئۆپیراتور.

**عمل گرایی** / 'amalgerāyî/: [عربی/ فارسی]/اسم. کردەوەگەری؛ بیر و بۆچوونێک کە کار و تێکۆشان بۆ گەیشتن بە ئامانج و سەرکەوتن، گرینگ‌تر لە هەموو شتێکی‌تر دەزانێ: **اصالت عمل**. هەروەها: **عملگرا**

**عملگی** / 'amalegî/: [عربی/ فارسی]/اسم. کرێکاری؛ کاریگەری؛ پیشەی کرێکار ‹سه ماه عملگی کردم: سێ‌مانگ کرێکاریم کرد›.

**عمله** / 'amale، ـها؛ عملجات/: [عربی]/اسم. ١. کرێکار؛ کاریگەر؛ بەرکار؛ کارگەر؛ کارکەری ئاسایی بەبێ لێزانیەکی تایبەت ٢. *[قدیمی]* دەسە و دایرە؛ دەستە و بەستە؛ دەسە و بەسە؛ کارکەران و هۆکارانی کارێکی زۆرتر ناڕەوا یان ناشیرین.

**عمله‌واکره** / 'amale-vo-akare، ـها/: [عربی] /اسم. *[تعریض]* دەست و پێوەند؛ هەموو خزمەتکاران و نۆکەران و ژێردەستان.

**عملی** / 'amalî/: [عربی] *صفت*. ١. کردنی؛ کردەوەیانە؛ شیاو و ڕەخساو بۆ کردن و جێبەجێ بوون ‹پیشنهاد عملی: پێشنیاری کردنی› ٢. خوازیاری کاری بە دەست و پێ. بەرانبەر:

فکری ۳. *[گفتاری]* تریاکی؛ مەفەنگی.

▣ **عملی شدن:** جێبەجێ بوون؛ ئەنجام دران؛ پێکهاتن؛ کران؛ بەڕێوە چوون. هەروەها: **عملی کردن**

**عملیات** / amalîyyāt'/: [عربی] *اسم.* ۱. جمعِ ☜ **عمل** ۲. کۆکار؛ چالاکی؛ کار و ڕەوت؛ زنجیرەکارێکی سەربەیەک بۆ مەبەستێکی دیاریکراو ‹عملیات بانکی: کۆکاری بانگی› ۳. چالاکی چەکداری؛ کار و خەبات.

**عمو** / amû' ، ـها؛ اعمام *[ادبی]*/: [عربی/ فارسی] *اسم.* مام؛ مامە؛ مامۆ؛ مەمۆ؛ ئام؛ ئامۆ؛ ئاپ؛ ئاپۆ؛ تانک؛ تاتک؛ تاتە؛ هاپۆ؛ هاپ؛ برای باوک: **عم**

**عمواوغلی** / amoqlî' ، ـها/: [عربی/ فارسی/ ترکی] *اسم. [گفتاری]* کوڕەمام؛ پسمام؛ کوڕئاپ؛ مامۆزا: **عَمقُلی**

**عمود** / amûd' ، ـها/: [عربی] *اسم.* ۱. دیرەک؛ کۆڵەکە؛ ئەستوون؛ ئەستوندەک؛ ستوون ۲. *[هندسه]* هێڵ یان پەڕەیێ کە لەیەل هێڵ یان پەڕەیەکی تردا سووچێکی $90^{\circ}$ دروست پێک بێنێ ۳. *[ادبی]* گورز.

**عمودی** / amûdî'/: [عربی] *صفت.* ۱. کۆڵەکەیی؛ ئەستوونی؛ ستوونی؛ ئەستوندەکی؛ ڕاست؛ بە باری وێستاو ۲. بە سووچی $90^{\circ}$ لەگەڵ هێڵی ئاسۆییدا ۳. *[کنایی]* ڕاوەستاو؛ وێسیاگ؛ بەوەستاوی.

**عموزاده** / amûzāde' ، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ئامۆزا؛ مامۆزا؛ ئامۆزاگ؛ هامۆزا؛ ئامۆزاو؛ کوڕ یان کچی مام.

**عموم** / omûm, 'umûm'/: [عربی] *ضمیر.* هەموو؛ هەموان؛ حام؛ گشت؛ گش؛ گرد؛ هەموو کەس.

**عموماً** / omûman, 'umûman'/: [عربی] *قید.* بەگشتی؛ گشت؛ هەموو؛ کترم؛ کترمی؛ وێکڕا؛ گرد؛ بە تێکڕایی ‹اهالی عموماً باسواد بودند: خەڵکی بەگشتی خوێندەوار بوون›.

**عمومی** / omûmî, 'umûmî'/: [عربی] *صفت.* هەموانی؛ هەمەلایەنە؛ تێکڕایی؛ تێگڕایی؛ گشتی؛ گشتلایی؛ گشتگیر؛ خەرجی ‹گرمابەی عمومی: حەمامی هەموانی›. بەرانبەر: **شخصی**

**عمومیت** / omûmîyyat, 'umûmîyyat'/: [عربی] *اسم.* هەموانیەتی؛ گشتیەتی؛ هەمەلایەنەیی؛ بار و دۆخی هەموانی بوون.

▣ **عمومیت دادن:** هەمەلایەنە کردن؛ گشتی کردن.

**عمومیت داشتن:** هەمەلایەنە بوون؛ بۆ هەموان بوون.

**عمومیت یافتن:** بوونە هەمەلایەنە.

**عمه** / amme' ، ـها/: [عربی] *اسم.* پوور؛ پووریێ؛ پوورکە؛ میمی؛ میمک؛ میمگ؛ میمگە؛ مەت؛ مەتی؛ مەتیە؛ مەتە؛ مەتک؛ ماتک؛ تیتک؛ ئامک؛ کچچی؛ کچی؛ پلک؛ پلکە؛ پیلک؛ پلە؛ پل؛ عەتە؛ دەدە؛ دێد؛ ئاییە؛ ئاییا؛ ئایە؛ بتی؛ خوشکی باوک.

**عمەزاده** / ammezāde' ، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* پوورزا؛ میمکەزا؛ میمزا؛ مەتێزا؛ مەتیەزا؛ منالی مەت؛ زارۆی پوور؛ خوشکەزای باوک.

**عمیق** / amîq'/: [عربی] *صفت.* قووڵ: ۱. نەقر؛ کوور؛ سووتار؛ قوویل؛ باهۆ ‹درّەی عمیق: دۆڵی قووڵ› ۲. ورد؛ تیژ؛ گرینگ و ئاتاجی سرنج و هەوڵی زەینی زۆر ‹بررسی عمیق: لێکدانەوەی ورد› ۳. سەرچاوەگرتوو لە ناخەوە؛ لە قووڵاییەوە دەرهاتوو ‹نفس عمیق: هەناسەی قووڵ›.

**عمیقاً** / amîqan'/: [عربی] *قید.* ۱. بە گاودی؛ بە قووڵی؛ بە کووڕی؛ بە نەقری ۲. سوور- سوور؛ بە شێلگیرییەوە.

**عن** / an'/ ☜ **آن**

**عناب** / annāb, 'onnāb' ، ـها/: [عربی] *اسم.* عەناب؛ عەنناب؛ ئەناو؛ عەناو؛ ونوو؛ عناف؛ سووراف؛ سنجی؛ سینجەی؛ سنجەی: ۱. دەوەنێکی دڕکاوی بە گەڵای گچکەی جوان

و لووس و ڕەنگی سەوزی تۆخەوە ٢. بەری ئەو دارە کە ئاماڵ سوور و لووسە، بە قەد دەنکە زەیتوونێ دەبێ، دەخورێ و بۆ دەرمانیش دەشێ.

**عنابی**[1] / 'annābî, 'onnābî/: [عربی]/اسم. عەنابی؛ دۆوی؛ سووری تۆخ؛ سووری ئاماڵ بنەوش.

هەروەها: **عنابی‌رنگ**

**عنابی**[2]: *صفت.* عەنابی؛ سوورتۆخ؛ بە ڕەنگی سووری ئاماڵ بنەوشەوە.

**عناد** / 'enād/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* دژمنی؛ دوژمنی؛ ناتەبایی؛ دژایەتی؛ ناکۆکی؛ نەیاری.

▣ **عناد ورزیدن:** دژایەتی کردن؛ دوژمنایەتی کردن؛ شەڕوسواژکردن؛ نەسازان؛ نەیاری کردن.

**عناصر** / 'anāser, 'anāsor/: [عربی] جمعِ ☜ **عنصر**

**عناق** / 'annāq/: [عربی]/اسم. *[نجوم]* کارژۆلە؛ سیاگۆش؛ ئەستێرەدوانەی کەلووی ورچی گەورە.

**عنان** / 'enān/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* هەوسار؛ هەڤسار؛ ئەفسار.

▣ **عنان تافتن:** *[مجازی]* چوونەوە سەر کۆنە قایە؛ هاتنەوە سەر گونەبۆرە؛ هەڵگەڕانەوە؛ هاتنەوە؛ گەڕانەوە؛ پاشەکشێ‌کردن: **عنان گردانیدن**

**عنان رها کردن:** *[مجازی]* بە پەلە ڕۆیشتن؛ بە خێرایی ڕۆیشتن؛ بە پڕتاو چوون؛ لنگاردان؛ بە هەڵەداوان ڕۆیشتن؛ بە تاو چوون.

**عنان کشیدن:** ڕاوەستان؛ وێستان؛ وەستان؛ وێسیان؛ هەوسارکێشان؛ چیتر بەرەو پێش نەچوون.

**عنان گردانیدن** ☜ **عنان تافتن**

**عنان‌گسسته** / 'enāngosaste/: [عربی/ فارسی] ☜ **افسارگسیخته**

**عنان‌گسیخته** / 'enāngosîxte/: [عربی/ فارسی] ☜ **افسارگسیخته**

**عناوین** / 'anāvîn/: [عربی] جمعِ ☜ **عنوان**

**عنایات** / 'enāyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **عنایت**

**عنایت** / 'enāyat/: [عربی]/اسم. ١. سەرنج؛ سەرنجە؛ کار و ڕەوتی ورد بوونەوە و تێڕامان ‹لطفاً عنایت بفرمایید: تکایە سەرنج بدەن› ٢. ـها؛ عنایات/ چاوەدێری؛ چاودێری؛ بە تەنگەوە بوون؛ بایەخدان؛ پێڕاگەیشتن وێڕای بەزەیی و دلۆڤانی ‹بە ما عنایت دارند: چاوەدێری ئێمە دەکەن›.

**عنبر** / 'ambar, 'anbar/: [عربی]/اسم. عەنبەر؛ عەمبەر: ١. ماکێکی بۆنخۆشی ڕەشە کە لە ورگی جۆرە ماسیەکدا بەرهەم دێ ٢. ـها/ دەوەنێکی دڕکاویە بە گوڵی زەردی زێڕینەوە کە عەترێکی خۆشی لێ دروست دەبێ: **فتنه**

**عنبرماهی** / 'ambarmāhî, 'anbar-/: [عربی/ فارسی] ☜ **کاشالوت**

**عنبری** / 'ambarî, 'anbarî/: [عربی] *صفت.* عەنبەری؛ عەنبەراوی؛ بە عەنبەرەوە.

**عنبرین** / 'ambarîn, 'anbarîn/: [عربی/ فارسی] *صفت. [ادبی]* عەنبەری؛ عەنبەرین؛ عەنبەراوی؛ تێکەڵ بە عەنبەر.

**عنبیه** / 'enabîyye، ـها/: [عربی]/اسم. گلێنە؛ ڕەشێنە؛ ڕەشک؛ بیلبیلە؛ ڕەشکێنە؛ ڕەشڕەشک؛ پێکهاتەیەک لە چاودا کە ڕێژەی تیرۆچوونی نوور ڕادەگرێ و لە ناوەڕاستەکەیدا گلارەیە کە تیشک لەوێوە دەگاتە تۆڕینەی چاو.

**عنتر** / 'antar، ـها/: [عربی]/اسم. عەنتەر؛ ئەنتەر؛ حەمتەر: ١. فلفل؛ قونسوور؛ مەیموونی لۆتی؛ چەشنێ مەیموون بە قوونی ڕووت و سوور و کلکی درێژەوە ٢. *[مجازی]* دزێو؛ نەچێ؛ مرۆی زۆر ناحەز و ناشیرین * **انتر**

**عنتری** / 'antarî/: [عربی]/اسم. لۆتی؛ ئەوی مەیموون و ورچ هەڵدەپەڕێنێ و پارە لە خەڵکی دەستێنێ.

**عندالاقتضا** / 'endal'eqtezā/: [عربی]/قید. لە کاتی خۆیدا؛ لە وەختی خۆیدا؛ لە کاتی شیاودا؛

کاتی خۆی؛ وەخت خوەی؛ لە کاتی باش و لەباردا ‹عندالاقتضا پول لازم تامین می‌شود: لە کاتی خۆیدا پارەی پێویست دابین دەکرێ›.

**عندالامکان** / endal'emkān'/: [عربی]قید. هەر دەس‌بدا؛ کاتی لوان؛ هەلی جوان؛ لە کاتێدا کە بڕەخسێ ‹عندالامکان بە تقاضای ایشان رسیدگی شود: هەر دەس‌بدا بە داخوازیان ڕابگەن›.

**عنداللزوم** / endallozûm'/: [عربی]قید. کاتی پێویست؛ لە کاتی نیازدا ‹عنداللزوم می‌توانید از کارگران روزمزد استفاده کنید: کاتی پێویست دەتوانن لە کرێکارانی ڕۆژمز کەلک وەربگرن›.

**عندالله** / endallāh'/: [عربی]قید. لە ڕێی خودا؛ ڕاوخواینە؛ بۆڕەزای خودا؛ بۆ ڕەزامەندی خوا ‹عندالله کار خیری صورت گرفته است: لە ڕێی خوا کارێکی خەیر کراوە›.

**عندالمطالبه** / endalmotālebe'/: [عربی]قید. کاتی داخوازی؛ لە کاتی داخوازدا؛ لە کاتی داوا کردن و گەرەک بووندا ‹عندالمطالبه کارسازی خواهد شد: کاتی داخوازی کارسازی دەکرێت›.

**عندلیب** / andalîb'، ـها؛ ـان/: [عربی]اسم. [ادبی] بلبل؛ بولبول؛ بیلبیل؛ شالوور؛ پەلەوەرێکی چکۆلەی دەنگ‌خۆش و خۆش‌ڕەنگ و جوانە، بەهاران دێتە خوێندن.

**عن‌دماغ** / andamāq'/: [؟] ☜ **آن‌دماغ**

**عنصر** / onsor'، ـها؛ عناصر/: [عربی]اسم. ١. توخم؛ هێمان؛ هەر کام لە چوار هێمانە، واتە: ئاو، ئاور، با و خۆڵ کە لە کۆندا بە بنەمای بەدیهاتنی بوونەوەرانیان دەزانی ٢. هێمان؛ هەر کام لەو هۆکارانە کە ئاکامی کارێ بەوانەوە بەستراوە ‹عنصر مذهب را نباید نادیده گرفت: هێمانی ئایین نابێ لەبیرکەین› ٣. [مجازی] کەس؛ کەسی نادیار و نەناسراو ‹عنصر نامشخص: کەسی نەناس› ٤. [شیمی] توخم؛ هێمان؛ هەر یەکە لەو یەکسەد و چەن ماکە بنەڕەتیانەی کە لە ئەتومگەلی یەکسان پێک‌هاتوون و بە شێوەی ئاسایی ناشکێن و شی نابنەوە.

**عنف** / onf'/: [عربی]اسم. ١. درشتی؛ گرژی ٢. زۆر؛ زۆری؛ زۆرداری؛ زۆرەملێ؛ زەبر و زەنگ؛ زۆرەکانی ‹تجاوز به عنف: دەسدرێژی بە زۆر›.

**عنفوان** / onfovān'/: [عربی]اسم. [ادبی] هەڕەت؛ هەڕەمە؛ جەنگە؛ قەبزە؛ گەرمە؛ تاف؛ دوخیانەت؛ دۆخیان؛ بن‌دەق؛ بەرایی؛ هەنگ؛ هنگ.

◙ **عنفوان شباب/ جوانی**: هەڕەتی لاوی/ لاوەتی؛ تافی جوانی.

**عنق** / onoq'/: [عربی]صفت. [گفتاری] مۆن؛ گرژ؛ گەمۆر؛ ناوچاوتاڵ؛ مۆڕ؛ مۆچ؛ ئەخماوی؛ ڕووگرژ؛ ڕووش ‹از خواب که بلند شد، خیلی عنق بود: کە لە خەو هەستا، زۆر مون بوو›.

**عنقا** / anqā'، ـها؛ ـان/: [عربی]اسم. [ادبی] سیرنگ؛ سیمر؛ سیمورغ؛ هوما.

**عنقریب** / anqarîb'/: [عربی]قید. بەزوویی؛ زووبەزوو؛ خێرا؛ بە زووترین کات ‹عنقریب وسایل لازم فرستاده می‌شود: بەزوویی پێداویستیەکان دەنێردرێن›.

**عنکبوت** / ankabût'، ـها؛ ـان/: [عربی]اسم. جاڵجاڵۆکە؛ جاڵجاڵووکە؛ کاکڵەمووشان؛ مروا؛ داپیرۆشک؛ پیرپیرۆشک؛ جۆلاتەنە؛ جۆلاکەرە؛ جۆلاویکەرە؛ جاتەنە؛ داوتەنە؛ داوتەنکە؛ جاوتەنە؛ جۆلاییتەنە؛ جۆلاییکەرە؛ جیلاباف؛ تەڤنپیرک؛ تەڤنەپیرک؛ کارتێنک؛ کارتێنە؛ تەڤن‌پێچ؛ کەروو؛ داوداوی؛ کەڤنی؛ تەبەتۆر؛ مێشەگیرە؛ مێشەگرە؛ بلۆ؛ برۆ؛ هەرە؛ بچە؛ پند؛ پندەپیر؛ پیرعەڤۆک؛ پیرهەڤووک؛ گوندورەک؛ ماماڵە؛ ماماڵەهەلاوێ؛ کارتینگەر؛ ناوی گشتی بۆ هەر کام لە مێروانی جاڵجاڵۆکەیی بە سەرسنگ و سکی بێ‌گرێ، پای شاویلکەیی و شەش جومگە، برێ بە چوار جووت چاو و برێ بێ‌چاو، برێکیان لە ناو خۆڵدا دەژین و برێکیان لە ئاودا و زۆرتر نێرەکانیان لە مێوینەکان بچووکترن: **کارتُنک**

**عنن** / anan'/: [از عربی]اسم. کەمێردی؛

خەساوی؛ خەسیاوی؛ خەسیاگی.

**عنوان** / 'onvān, 'envān، ـها؛ عناوین/: [عربی] /اسم. سەرناو؛ سەردێڕ؛ ناو و نیشان: ۱. پێناسە؛ سەرتۆپ؛ ئەوەی بۆ ناساندنی کەسێ یان جێگایەک بە کار دێ (وەک: کوردستان، سەرۆک‌کۆمار، شارەوانی و...) ۲. نووسراوەیەک لە سەر ڕۆژنامە، گۆڤار یان پەرتووکێ کە پێناسەکانی (وەک ناو، نووسەر، بلاڤۆک، مێژوو،...) پیشان دەدا ‹عنوان کتاب: سەردێری کتێب› ۳. دێڕێ لە سەرووی گوتار یان نووسراوەیەکدا کە دەربڕی چەمک یان مەبەستەکەیە ‹عنوان مقاله: سەردێری گوتار› ٤. ناو؛ وشە یان دێڕێ کە نیشاندەری پلە، جێگە یان کاری کەسێکە (وەک: نێژیارڤان، سەرۆک، فێلباز) ٥. ئەوەی وەکوو بابەتێک بەرچاو دەخرێت.

◘ **عنوان شدن**: خرانە بە رچاو/ باس؛ کەوتنە بەر باس/ چاو؛ بەر باس خران؛ کەوتنە بەر لێدوان؛ دەرخستن و کەوتنە بەر باس و لێکۆلینەوەی شتێ ‹مسئله انحلال شرکت از سوی یکی از حاضران عنوان شد: بابەتی هەلوەشاندنەوەی بەشدارگە لە لایەن یەک لە ئامادەبوانەوە خرایە بەرچاو›. هەروەها: **عنوان کردن**

**عنوان‌بندی** / 'onvānbandî, 'envān-/: [عربی/ فارسی]/اسم. سەردێڕبەندی؛ سەرناوبژێری: ۱. کار یان ڕەوتی ڕێکخستن و پەرتاوتنی سەرناوگەلی پێوەندیدار بە فیلم، بلاڤۆک یان پاژەکانی پەرتووکێکەوە ۲. نووسراوە، وتار، وێنە یان مووسیقایێ کە بۆ ناساندنی فیلم، بەرنامەی تلەڤیزیۆن یان ڕادیۆ بە کار دەچێ (وەک ناوی بەرنامە یان فیلم، نووسەر، دەرهێنەر و...).

**عنیف** / 'anîf/: [عربی] صفت. ۱. ناخۆش؛ ناحەز؛ درێو ۲. گرژ؛ درشت؛ زۆرەکی؛ بە زۆری؛ وێڕای زۆر و توند و تیژی.

**عنین** / 'anîn/: [عربی] صفت. لە مێردی کەوتوو؛ کەم‌مێرد.

**عوا** / 'avvā/: [عربی]/اسم. /نجوم/ عەوا: ۱. کەلوویەک لە ئاسمانی نیوەگۆی باکووری کە سەماکی ڕامیح ڕۆشن‌ترین ئەستێرەیەتی ۲. ناوی پێنج ئەستێرەی وێنەی گەردوونی هێشوو.

**عوائد** / 'avā'ed/: [عربی] ☜ **عواید**

**عوارض** / 'avārez/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **عارضه** ۲. پیتاک؛ باج؛ چەشنێ خوویک کە ڕێکخراوەگەلی دەوڵەتی لە هەمبەر ڕاژەیەکی تایبەتەوە وەریدەگرن ‹عوارض نوسازی: پیتاکی نوێسازی›.

**عوارضی** / 'avārezî/: [عربی]/اسم. پیتاکی؛ باجگرخانە؛ جێگەی وەرگرتنی پیتاک ‹جلو عوارضی توقف کردیم: لە بەر پیتاکیەکەدا ڕاوەستاین›.

**عواریه** / 'avārîy(y)e/: [عربی] ☜ **آواریه**

**عواطف** / 'avātef/: [عربی] جمعِ ☜ **عاطفه**

**عواقب** / 'avāqeb/: [عربی] جمعِ ☜ **عاقبت**

**عوالم** / 'avālem/: [عربی] جمعِ ☜ **عالَم**

**عوام**[1] / 'avām/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **عامی** ۲. مرۆی ئاسایی؛ عەوام؛ کۆمرەی خەڵکی ئاسایی، بەبێ هیچ چەشنە سەرتریەکی تایبەت.

بەرانبەر: **خواص**

**عوام**[2]: صفت. ڕەمەکی؛ بەبێ زانیاری، زانست و بۆچوونی کۆمەڵایەتی ‹وقتی روزنامەنویس عوام باشد، تکلیف روزنامەخوان معلوم است: کاتێ ڕۆژنامەوان ڕەمەکی بێ، ئاکامی ڕۆژنامەخوێنیش دیارە›.

**عوام‌الناس** / 'avāmonnās/: [عربی]/اسم. حەشامات؛ نزمەخەڵک؛ خەڵکی ئاسایی؛ مرۆی ئاسایی و ڕەمەکی.

**عوامانه**[1] / 'avāmāne/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕەمەکیانە؛ بە شێوە یان ڕێبازی مرۆی ئاسایی ‹این تفسیرهای عوامانه از چنتەی چە کسی در آمده است؟: ئەم ڕاڤە ڕەمەکیانە لە هەمانەی کێوە

دەرهاتووە›.

**عوامانه**[٢]: *قید.* ڕەمەکیانە؛ بە ڕەوشتی عەوام ‹عوامانه حرف می‌زد و اسباب تفریح حاضران شده بود: ڕەمەکیانە قسەی دەکرد و ببووە گاڵتە و گەمەی ئامادەبووان›.

**عوامپسند** / avāmpasand'/: [عربی/ فارسی] *صفت.* خەڵک‌پەسند؛ بە پەسنی خەڵکی ئاسایی ‹قصەی عوام‌پسند: چیرۆکی خەڵک‌پەسند›.

**عوامفریب** / avāmfarîb' ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* خەڵک‌خڵەتێن؛ خڵەتێنەری حەشامات و خەڵکی ئاسایی ‹شیخ عوام‌فریب: شێخی خەڵک‌خڵەتێن›.

**عوامفریبی** / avāmfarîbî' ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* خەڵک‌خڵەتێنی؛ خەڵک‌فریوی؛ کار یان ئاکارێ کە بە مەبەستی فریودان و هەڵەخستنی خەڵک دەکرێ (وەک بەڵێنی درۆیی دان، فرۆشتنی بەهەشت و ...).

**عوامفهم** / avāmfahm'/: [عربی] *صفت.* گلافام؛ گشفام؛ شیاوی تێگەیشتنی خەڵکی نەخوەنە و ئاسایی.

**عوامل** / avāmel'/: [عربی] جمعِ ☜ **عامل**

**عواید**/ avāyed'/: [عربی] جمعِ ☜ **عایدی: عوائد**

**عود** / owd, 'o:d'/: [عربی] *اسم.* ڕەوتی گەڕانەوە؛ سەرهەڵدانەوە؛ گەڕیاوە؛ بەراوگەڕ؛ هاتنەوە؛ ئەواگێڵ.

▣ **عود کردن**: سەرهەڵدانەوە؛ هەڵدانەوە؛ هەڵەودان؛ بۆ هاتنەوە؛ هەڵگەڕانەوە؛ هەڵگەڕیانەوە (لەمەڕ ژان و نەخۆشی)؛ کۆلانن؛ ئەواگێڵ بیەی؛ هۆرەوەدەی ‹باز پادردم عود کرد: دیسان پائێشەکەم سەری هەڵداوە›.

**عود** / ûd'/: [عربی] *اسم.* بەربەت؛ ڕوباب؛ عوود؛ عوودە؛ ئامێرێکی مووسیقایی ژێدار بە کاسەیەکی گەورەی وەک لەتی هەرمێ، دەسکی زۆر کورت و دەتاڵ یان پێنج جووتە ژێوە کە بە پێژەن دەژەنرێ.

**عودت** / owdat, 'o:dat'/: [عربی] *اسم.* وەرگەڕ؛ بەراوگەڕ؛ ئەواگێڵ؛ هەڵوەگەڕ؛ هەڵەوگەڕ؛ کاری گەڕانەوە؛ وەرگەڕانەوە.

▣ **عودت دادن**: هەناردنەوە؛ دانەوە؛ گەڕاندنەوە؛ دایەوە؛ دەش دانەوە ‹پولی را کە فرستادە بود عودت دادە شد: ئەو پارەیە ناردبووی ناردرایەوە›.

**عور**[١] / ûr'، ـها/: [عربی] *اسم. [گفتاری]* عینوان؛ ناز؛ کریشمە: **أور**

**عور**[٢]: [عربی] *صفت. [گفتاری]* پەتی؛ قووت؛ پشروول؛ زەلووت؛ زلووت؛ چەکە؛ زلیت؛ ڕووس؛ ڕویس؛ ڕیس؛ کوت؛ لوت؛ ڕووت؛ ڕویچ؛ تازی؛ عەمەنە ‹لخت و عور: ڕووت و پەتی›: **أور**

**عورت** / owrat, 'o:rat'/: [عربی] *اسم.* عەورەت؛ شەرموا؛ شەرمگا؛ شەرمیا؛ بەشێ لە لەشی مرۆڤ کە ئەندامانی زاوزێی تێدایە و زۆرتر خەڵکی دایدەپۆشن.

**عورتین** / owrateyn, 'o:rateyn'/: [عربی] *اسم. [ادبی]* بەر و پشت؛ بەر و دوا؛ گەڵوقنگ؛ شەرمگا و سمت.

**عوض** / avaz'/: [عربی] *اسم.* دەسەوا: ١. ئەوەی لە جێی شتێکە ‹عوض داشتن: دەسەوا بوون› ٢. دەسوام؛ دەسوەوام؛ دەسبایی؛ هەڤگەڵ؛ ئەوەی لە بەرامبەر شتێکەوە دەیدەن یان دەیکەن ‹عوض دادن: دەسەوا دان› ٣. *[حقوق]* کرێ؛ کرێها؛ کراها؛ کراهە.

▣ **عوض دادن**: دەسەوا دانەوە؛ دەسبایی دانەوە؛ دەسوام دان؛ بە جێگە یان لە بایی شتێک دانەوە ‹خدا بە تو عوض دهد: خودا دەسەوات بداتەوە›. هەروەها: **عوض گرفتن**

**عوض داشتن**: دەسەوا بوون؛ دەسەوام بوون ‹چیزی کە عوض دارد، گله ندارد: ئەوی دەسەوا بێ، گلەی نابێ›.

**عوض شدن**: گۆڕان؛ گووریان؛ واریەی ‹شهر

خیلی عوض شده است: شار زۆر گۆراوە›.
عوض کردن: گۆڕین؛ گۆڕان؛ گۆڕاندن؛ گوهەڕین؛ گوهەڕاندن؛ گوهارتن ۱. گۆڕانەوە؛ ئەوەوارەی؛ وارایوە؛ گۆڕینەوەی شتێک بە شتێکی تر ۲. ئاڵوگۆڕ کردن؛ ئالشت‌کردن؛ وارای؛ وارتەی ‹صدایش را عوض کرده بود تا نشناسم: دەنگ خۆی گورابوو نەیناسم›.
**عوض بدل** / 'avazbadal/: [عربی]/اسم. /گفتاری/ ئاڵوویر؛ ئالشت؛ ئالیشت؛ ڕشت؛ ئاڵوگۆڕ؛ واڕوگۆڕ؛ ئاڵوگۆڕی؛ گوهێرەک؛ هەڤگلی؛ ئالش‌وێرش؛ هەڤگەلی ڕەوتی پێکەوە گۆڕان ‹محصولشان را می‌آوردند و مثل هزاران سال پیش با هم عوض‌بدل می‌کردند: بەرهەمەکانیان دەهێنا و وەکوو هەزار ساڵ لەمەو پێش ئاڵوویریان دەکرد›.
**عوضی** [1] / 'avazî/: [عربی] صفت. ۱. جێوەجێ؛ جێگەوەجێگە؛ جێ‌لەجێ ‹این دارو عوضی است: ئەم دەرمانە جیوەجییە› ۲. /گفتاری/ نالەبار؛ نائاسایی؛ نەگونجاو؛ هەرچی-پەرچی ‹آدم عوضی: مرۆی نالەبار›.
**عوضی** [2]: قید. جێوەجێ؛ جێگەوەجێگە؛ جێ‌لەجێ؛ وێڕای هەڵە و پەڵە ‹عوضی دیدم: عوضی گفت: جیوەجی دیم؛ جیگەوەجیگە گوتی›.
▣ عوضی گرفتن: لێ‌گۆڕان؛ لێ تێک‌چوون؛ بە هەڵەدا چوون؛ نابەجێ‌گرتن؛ کەسێ یان شتێ، بە هەڵە لە جێی کەسێ یان شتێکی‌تر زانین ‹ببخشید! شما را با آرام عوضی گرفتم: ببوورن! ئێوەم لەگەڵ ئارام لێ‌گورا›.
**عـو ـــ عـو** / 'ow.'ow/: صوت. حەپەحەپ؛ حەوحەو؛ حەوەحەو؛ حەمپەحەمپ؛ عەف؛ حەپ؛ حەپە؛ گەف؛ گەفە؛ عەفت؛ عەف‌عەف؛ وەڕە؛ ڕەوە؛ وەڕ- وەڕ؛ وەڕە-وەڕە؛ ڤراسە؛ دەنگی سەگ.
▣ عوعو کردن: حەپەحەپ‌کردن؛ وەڕین؛ حەپین؛ حەپاندن؛ گەپین؛ کەوتاندن؛ گەفەی؛ گەفای؛ وەڕانن؛ ڕەیین؛ ڕەوین.
**عون** / 'own/: [عربی]/اسم. /ادبی/ یاری؛ یاریدە؛ یاریدەیی؛ ئاریکاری؛ هاریکاری؛ یارمەتی؛ یاریە؛ یاردەی ‹به عون الهی این کار را تمام می کنیم: بە یاری خودا ئەم کارە تەواو دەکەین›.
**عهد** / 'ahd/، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. /عُهود/ پەیمان؛ پەیمانە؛ بەڵێن؛ سوز؛ سۆست؛ مەرج؛ بڕیار؛ میجاز؛ قەوڵ؛ گفت ‹عهد بستن: پەیمان بەستن› ۲. ڕۆژگار؛ ڕۆژیار؛ سەردەم؛ دەوران؛ ڕۆژان؛ سەردەمان؛ ڕۆژ؛ دەورە ‹عهد شاه‌عباس: ڕۆژگاری شاعەباس›.
▣ عهد بوق/ دقیانوس: /کنایی/ قەڕنی بۆق/ دەقیانووس؛ ساڵ بەفرە قورسەکە؛ ڕۆژگاری زۆر لە مێژینە و دوور.
عهد جدید: دەورانی نوێ؛ کۆمەڵە نووسراوەگەلی پیرۆزی خاچپەرستان (بریتی لە ئینجیلەکان، نامیلکەکانی پولس، کردەوەی ڕەسوولان و...).
عهد عتیق: دەورانی کۆن؛ تەورات؛ کۆمەڵە نووسراوەگەلی پیرۆزی جوولەکان.
▣ عهد بستن: بەڵێن دان؛ پەیمان بەستن؛ پەیمان دانان؛ پەیمان دان؛ پەیمان بینتەی؛ سۆست/ سۆز بەستن؛ پەیمان گرێدان ‹با هم عهد بستند که این راز را به کسی نگویند: پێکەوە بەلینیان دا ئەم ڕازە بە کەس نەیژن›.
**عهدشکن** / 'ahdšekan/، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پەیمان‌شکێن؛ بێ‌بەڵێن؛ کامباخ؛ کەمباخ.
**عهدشکنی** / 'ahdšekanî/، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. پەیمان‌شکێنی؛ بێ‌بەڵێنی؛ کامباخی؛ کەمباخی.
**عهدنامه** / 'ahdnāme/، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پەیمان‌نامە؛ بڕیارنامە؛ بەڵێن‌نامە؛ سۆست‌نامە؛ نووسراوەیەک وێڕای گرێدانکی دوو یان چەن دەوڵەت.

**عهده** / 'ohde/: [عربی]/سم. ئەستۆ؛ پا؛ سەر؛ مل؛ عۆده ‹خرید میوه به عهدەی من: سەندنی میوه لە ئەستۆی من›.

▣ **از عهده برآمدن:** لە عۆده هاتن؛ دەرعەوە هاتن؛ باشار هاتن؛ چار کردن/ هاتن؛ دەرقەت هاتن؛ توانین (لەمەڕ پەیمان یان بڕیارەوە) ‹او از عهده این کار برنمی‌آید: ئەو بێت و لە عودەی ئەم کارە نایەت›.

**بر/ به عهده داشتن:** بە/ وە/ لە ئەستۆ بوون؛ بە ملەوە بوون ‹ریاست جلسه را او برعهده داشت: سەرۆکایەتی دانیشتنەکە لە ئەستۆی ئەو بوو›.

**بر/ به عهده گرفتن:** وە/ بە/ لە ئەستۆگرتن؛ لە مل‌گرتن؛ بە دەست‌گرتن؛ خۆ لە قەرەی کارێک دان؛ ئەنجامدانی کارێک پەزیران ‹نگهداری بچەها را بر عهده گرفت: ڕاگرتنی مندالەکانی وە ئەستۆ گرت›.

**عهده‌دار** / 'ohdedār/: [عربی/ فارسی] صفت. وەستۆگر؛ ئەستۆگر؛ بە بەڵێن بۆ جێبەجێ کردنی کارێک ‹او عهده‌دار خرید است و من عهده‌دار پخت و پز: ئەو ئەستۆگری سەندنە و من وەستوگری چێشت لێنان›. هەروەها: **عهده‌داری**

**عهود** / 'ohûd, 'uhûd/: [عربی] جمعِ ☜ **عهد**

**عیادت** / 'ayādat, 'îyādat، ـها/: [عربی]/سم. دیدار؛ دیار؛ دیدەنی؛ کار و ڕەوتی سەردان؛ بەسەرکردنەوە؛ ڕۆیشتن بۆ لای کەسێ ‹عیادت بیمار: سەردانی نەخۆش›.

▣ **عیادت کردن:** سەردان؛ دیدارکردن؛ بەسەر کردنەوە؛ بۆ دیدەنی ڕۆیشتن؛ بۆ لای کەسێ چوون؛ دیدەنی/ دیەنی کردن ‹از آسیب‌دیدگان سیل اخیر عیادت کرد: سەری لە گەزن‌لێ‌کەوتوانی ئەم لافاوە دواییینە دا›.

**به عیادت آمدن:** بۆ سەردان هاتن؛ هاتن بۆ بەسەرکردنەوە؛ دیدار لێ کردن؛ بۆ دیدەنی هاتن؛ هاتن بۆ لای کەسێ. هەروەها: **به عیادت رفتن**

**عیاذبالله** / 'ayāzobellāh/: [عربی] دعا. ۱. پەنا بە خودا؛ پەنا بۆ خوا؛ پەنا بە خوای ۲. خوای نەکردە؛ خوانەکەردە؛ خوانەخواسە؛ خوا ئەو ڕۆژە نەکا/ نەیرێ؛ حەف قورعان لە بەینا بێ * **العیاذبالله**

**عیار** / 'ayār، ـها/: [عربی]/سم. عەیار؛ عیار: ۱. ڕێژەی کانزایەکی گرانبایی لە کانە یان ئالیاژێکدا ‹طلای ۲۴ عیار: زێڕی ۲٤ عەیار› ۲. [شیمی] ئەوەندە لە ماکێ کە بۆ بەدیهێنانی کاردانەوە یان وێکهاتن لەگەڵ بارستێکی دیاریکراو لە ماکێکی‌تر، پێویستە ۳. مەزەننە؛ مەزندە؛ پێوەر؛ پێوانە؛ ڕادەی ناوین ‹حالا عیار دستت آمد؟: ئێستا مەزندەت هەیە؟›.

**عیار**[1] / 'ayyār، ـها؛ ـان/: [عربی]/سم. [قدیمی] چەتە؛ گۆران؛ عەییار؛ کەسێ کە ڕێگری و دەسبڕی دەولەمەندانی دەکرد و دەستی نەدارانی دەگرت.

**عیار**[2]: صفت. تەڕدەست؛ چاوبەست؛ زیرەک؛ چالاک؛ مەزبووت؛ دەس‌سووک؛ دەس‌سۆک؛ بە دەست و برد؛ گورج و گۆڵ؛ چازان؛ شازا؛ فێڵەزان.

**عیارسنجی** / 'ayārsanci، ـها/: [عربی/ فارسی] /سم. عەیارپێوی؛ دەسنیشان کردنی ڕێژەی کانزایەکی گرانبایی لە شتێکدا.

**عیاری** / 'ayyārî/: [عربی]/سم. چەتەیی؛ گۆرانی؛ عەییاری؛ کاری چەتەگەری ‹می‌گویند یعقوب لیث در آغاز عیاری می‌کرد: دەڵێن یەعقووبی لەیس سەرەتا چەتەیی دەکرد›.

**عیاش** / 'ayyāš/: [عربی] صفت. خۆشگوزەران؛ وەشبەر؛ دڵچەرێن؛ خۆش‌ڕۆژ؛ خۆش‌ڕابوێر؛ چەشتی خوشگوزەرانی و ڕابواردن ‹آدم عیاش با فردا کاری ندارد: مرۆڤی خوشگوزەران گوێی لە بەیانی نیە›.

**عیاشی** / ayyāšî' ، ـها/: [عربی]/سم. دڵـچەرێنی؛ خۆش‌ڕۆژی؛ خـۆش‌ڕابـوێری؛ خوەشـگوزەرانی؛ وەشبەری؛ زیدەڕۆیی لە خۆش‌ڕابوێری بەتایبەت گوێ‌نەدان لە بایەخگەلی ئاکاری و کۆمەلایـەتی ‹بە جای درس خواندن، با این دوستان نابـابش مشغول عیاشی است: لە بـاتی دەرس خوێنـدن، لەگـەڵ ئـەو دۆستە بێ‌ئاکارانەیەدا خەریکی دلچەرێنیە›.

**عیال** / ayāl'/: [عربی]/سم. خێزان: ۱. کـەیوانوو؛ کەیبانوو؛ هـەڕەم؛ کابـان ‹بـا عیـال دعوامـان شـد: لەگەڵ کەیوانوو بوو بە شەڕمان› ۲. /عایله//قدیمی/ خا و خێزان؛ ماڵ و منداڵ؛ کەسانی ژێر خێـوەتی ماڵێک ‹ای گرفتار پایبند عیـال / دگـر آسـودگی مبنـد خیال: ئەی گیرۆدە و تووشـیاری خـاوخێزان / چیتـر بیر مەکەوە لە خۆشی و سەیران›.

**عیالوار** / ayālvār' ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسـی]/سم. خێزانبـــار؛ خێزانـــدار؛ منداڵـــبار؛ ژن و منداڵـــدار؛ هەڕەمدار؛ بـژن و زارۆک؛ عایلەمـەن؛ خـاوەنی ژن و منداڵ ‹آدم عیالوار کـە آسـودگی نـدارد: مـرۆی خێزانبار خۆ ئاسایشی بۆ نیە›.

**عیـالواری**[1] / ayālvārî'/: [عربـی/ فارسـی]/سم. خێزانبـــاری؛ خێزانـــداری؛ ژن‌ومنداڵـــداری؛ منداڵـباری؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی خێزانبـار بـوون ‹عیـالواری و نـان درآوردن نگذاشـت درسـش را ادامـه دهـد: خێزانبـــاری و نـــان دەرهێنـــان نەیهێشـــت درێژە بە خوێندنەکەی بدا›.

**عیـالواری**[2]: صـفت. خێزانـــداری؛ خێزانبـــاری؛ منداڵباری؛ گونجاو بۆ کەسی خێزاندار ‹یک خانەی عیالواری برایت پیدا کردەام: ماڵێکی خێزانداریـم بـۆت دۆزیوەتەوە›.

**عیــان** / ayān'/: [عربـی] صـفت. ئاشـکرا؛ ڕوون؛ ڕووناک؛ ڕۆشـناک؛ ڕۆشن؛ دیار؛ ڕاشکاو ‹آن را کە عیـان اسـت چە حاجـت بـە بیـان اسـت: ئـەوەی کـە ئاشکرایە کوا پێویستی بە چرایە›.

▣ **عیـان بـودن**: دیـار بـوون؛ ڕاشـکاو بـوون؛ ئاشکرا بوون. هـەروەها: **عیـان شـدن؛ عیـان کردن**

**عیب** / eyb' ، ـها؛ معایب/: [عربـی]/سم. ۱. /عیوب/ زەدە؛ خەش؛ کەمایەسی؛ خەوش؛ ئاسیو؛ ئـەیو؛ ئێڤ؛ ئشکیل ‹چشمش عیب داشـت: چـاوی زەدەی بوو› ۲. شوورەیی؛ شوورە؛ پیتک؛ کەترە؛ عەیب؛ ئلا؛ ئەوەی کە لەگەڵ داب وبایەخی کۆمەڵـگادا یەک ناگرێتەوە ‹این کارها کە می‌کنـی عیـب اسـت: ئەم کارانە کە دەیکەی شوورەییە›.

▣ **عیب پیدا کـردن**: ۱. خـراپ بـوون؛ لـە کـار کەوتن؛ عەیب لێ پەیدا بوون ‹ماشین عیب پیـدا کـرد: ماشـینەکە خـراپ بـوو› ۲. عـەیب لـێ دۆزینەوە؛ کـەم‌وکـووڕی دۆزینـەوە؛ خـەوش دۆزینەوە ‹می‌گشت توی لباس‌ها دو تـا عیـب پیـدا می‌کرد و بهانە می‌گرفت: دەگەڕا بـە نـاو جلەکانـدا دوو عەیبی لی دەدۆزینەوە و بیانووی دەگرت›.

**عیب کردن**: خراپ بوون؛ خراو بوون ‹ترمـزش عیب کردە: تورمزەکەی خراپ بووە›.

**عیب گذاشتن روی کسی/ چیزی**: عەیب پێـوە نـان؛ عـەیب لکانـدن بـە کەسـێ/ شـتێکەوە؛ عەیب بۆ کەسێ/ شتێک دەرهێنـان؛ خـەوش بە سەر کەسـێ/ شـتێکەوە نـان؛ کەمایەسـی درۆینە دانە پاڵ کەسـێ یـان شـتێکەوە ‹آقـا نمی‌خری نخر، چـرا عیـب روی جـنس مـی‌گـذاری؟: کاکە ناسێنی مەسێنە، بۆچی عەیب بە شـتەکەوە دەنیی؟›.

**عیب گرفتن**: عەیب‌گرتن؛ خـەوش هەڵـگرتن؛ خراپی یان نابەجێیی شتێک گێڕانەوە ‹از چنـد جای خانە عیب گرفت و خواست آنها را برایش درست کنـیم: لـە چەنـد جێـی ماڵـەکە عـەیبی گـرت و ویستی بۆی چا بکەینەوە›.

**عیبجو** / aybcû' ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسـی] صـفت. عەیبگر؛ لێگـر؛ ئیرادگـر؛ خووگرتـوو بـە عـەیب گرتن.

**عیبجـویی** / aybcûyî' ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. لێگـــری؛ عـــەیبگری؛ کـــار و ڕەوتی

پەڕاندنە قوڕوو ‹آمدی و با این خبرت عیش ما را کور کردی: هاتی و بەم هاواڵەت خۆشیت لیمان شیواند›.

**عیش‌ونوش** / 'eyš-o-nûš'، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. عەیش‌ونۆش؛ خواردن و خواردنەوە؛ ڕابواردن و خۆش‌گوزەرانی ویڕای خواردنەوەی ئەلکولی.

**عیلامی** / 'îlāmî'/: [؟] ☜ **ایلامی**

**عین** / 'eyn'/: [عربی] /اسم. ۱. عەین؛ ناوی عەرەبی بیست و یەکەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی ۲. بژیک؛ ئەوەی کە هەبوونێکی سەربەخۆی هەبێت ۳. خود؛ خۆ؛ ویژی؛ وژی؛ خودی شت ‹عین شناسنامه و رونوشت آن: خودی پێناسەکە و کوپیەکەی›.

**عین** / 'eyne'/: [عربی] حرف. /گفتاری/ وەک؛ وەکوو؛ وەکی؛ کوتومت؛ چەشن؛ دەردی؛ عەین و مەین؛ عەین و مەغان؛ کفت؛ کفتی؛ وەکەتێ؛ هەر وەکوو؛ هەر کوتوو ‹عین گرگ گرسنه: وەک گورگی برسی› ۵. /فلسفه/ دنیا؛ جەهان؛ جیهان.

⊡ **عین خیال کسی نبودن**: /گفتاری/ بای خەیاڵی کەسێک نەبوون؛ سەر خەیاڵ کەسێ نەبوون؛ هیچ گوێ نەدان ‹هفتاد ضربه شلاق خورد و عین خیالش نیست: حەفتا دانە شەلاخی خوارد و بای خەیاڵی نیە›.

**عیناً** / 'eynan'/: [عربی] قید. کوتومت؛ وەک؛ وەکوو؛ وەکی؛ ڕاست وەک؛ هەر وەکوو؛ تەواو وەک؛ عەین و مەعان؛ عەین و مەین؛ هەر وەکوو خۆی.

**عین‌الثور** / 'eynossowr'/: [عربی] ☜ **دَبَران**

**عینک** / 'eynak'، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. چاویلکە؛ چاویلە؛ چاڤک؛ چەعفک؛ گۆزلک؛ بەرچاڤک؛ گوێزلک؛ عەینەک؛ عەینەکێ؛ کەرەستەیەک بۆ یاریەدانی سۆمای چاو یان بەرگری لە وەزەنگی هۆکارگەلی دەرەکی، پێکهاتوو لە دوو نیسکە (شیشەی ڕەنگی یان دەڵق) لە نێو قاپێکدا کە لە سەر لووت و لە بەرامبەر چاودا دادەنرێ و بە دوو دەسکی گێڕەوە لە پشت گوێ قایم دەکرێ.

⊡ **عینک زدن**: چاویلکە لێدان؛ چاڤک لێدان؛ چاویلکە کردنە چاو؛ عەینەک نیان؛ چاویلکە لە چاوکردن.

**عینکی** / 'eynakî'، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. چاویلکەیی؛ چاڤکی؛ بەرچاڤکی؛ بەرچاڤکری: ۱. چاویلکە لە چاو ‹آن آقای عینکی را ببین: چاو لەو پیاوە چاویلکەییە کە› ۲. خووگرتوو بە چاویلکە ‹تو هم عینکی شدی: تۆیش بوویتە چاویلکەیی›.

**عین گرایی** / 'eyngerāyî'/: [عربی/ فارسی] ☜ **برون‌گرایی**

**عینهو** / 'eynahû'/: [از عربی] حرف. /گفتاری/ هەر وەک؛ هەر وەکوو؛ وەکوو؛ وەک؛ وەکی؛ وێنەی؛ هۆسە؛ پیسەو ‹عینهو دختر چهارده ساله: هەر وەک کچی چواردە ساڵە›.

**عینی** / 'eynî'/: [عربی] صفت. ۱. دیتنی؛ بەرچاوی؛ پێش‌چاڤی؛ دیار؛ خاوەنی هەبوونی شیاوی دیتن. بەرانبەر: **ذهنی** ۲. بەرچاو؛ ئاشکرا؛ ئاشکار.

**عینی گرایی** / 'eynîgerāyî'/: [عربی/ فارسی] ☜ **برون‌گرایی**

**عینیت** / 'eynîyyat'/: [عربی] /اسم. دیاریەتی؛ ئاشکرایەتی؛ بەرچاویەتی؛ پێش‌چاڤەتی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی بەرچاو بوون ۲. دۆخ یان چۆنیەتی بوونی سەربەخۆ و شیاوی دیتن.

**عیوب** / 'oyûb, 'uyûb'/: [عربی] جمعِ ☜ **عیب**

**عیوق** / 'ayyûq'/: [عربی] /اسم. /نجوم/ پێنجەمین ئەستێرەی درەوشاوەی ئاسمان، لە کەلووی گاریچی.

# غ

**غ** / q/: *حرف.* غ؛ نیشانەی بیستودووهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**غ** / qe/: *اسم.* غێ؛ ناوی بیستودووهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**غائب** / qā'eb/: [عربی] ☜ **غایب**

**غائط** / qā'et/: [عربی] ☜ **غایط**

**غائله** / qā'ele/: [عربی] ☜ **غایله**

**غائی** / qā'î/: [عربی] ☜ **غایی**

**غار** / qār ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ١. ئەشکەوت؛ ئەشکەفت؛ ئشکەفت؛ شکەفت؛ نوا؛ زاخۆر؛ زایەند؛ غار؛ خار؛ مەڕ؛ مەڕە؛ کاو؛ کاف؛ قەوارت؛ مغار؛ مغارە؛ مەغارە؛ مەخرا؛ وەرما؛ کەلما؛ کەلوەز؛ کافک؛ کۆڤ؛ قەف؛ زڤنگ؛ کەوەر؛ کەوور؛ کەووڕ؛ کەوڕک؛ کەورگ؛ کەوەرگ؛ کوونرەخ؛ کومزەخ؛ کووڵ؛ هوولولیف؛ غولۆلیف؛ خوولولیف؛ تون؛ هلۆڵ و ڕەهۆڵی سروشتی لە کێودا ٢. ☜ **برگ بو**

**غارت** / qārat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* چەپۆ؛ چەپاو؛ تالان؛ تاراج؛ چرپوچاپ؛ پوویر؛ پووڕ؛ پویر؛ پویڕ؛ یاخمە؛ زاخۆران؛ پوپڕ؛ تالوو؛ گلاهە؛ کالات؛ کالەت؛ فەرهوود؛ تالان و مالان؛ تالان و بڕۆ؛ پەلیسە؛ کارەڕەهاتی ستاندن بە زۆر و بردن ‹ریختند و بسیاری از خانه‌ها را غارت کردند: هێرشیان هێنا و ماڵێکی زۆریان تالان کرد›. هەروەها: **غارت شدن؛ غارت کردن**

**غارتگر** / qāratgar ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* نژدە؛ تالانکەر؛ چەپاوکەر؛ خواس؛ قەرەپشی؛ بە خۆ و خدەی تالانکردنەوە.

**غارتگری** / qāratgarî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ڕێگری؛ نژدەیی؛ تالانکەری؛ بار یان چۆنیەتی تالانکەر بوون.

**غارتی** / qāratî/: [عربی] *صفت.* تالانی؛ تالانکراو؛ چەپلاو؛ چەپاوی؛ دزراو؛ گلاهە؛ دامەلاغاس؛ پوڕکری؛ شەلی؛ شەلیای؛ بە تالان براو ‹مال غارتی: ماڵی تالانی›.

**غارشناسی** / qāršenāsî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ئەشکەوتناسی؛ غارناسی؛ زانستی ناسینەوەی ئەشکەوت لە ڕووی شوێنی جوگرافیایی، پێکهاتەی زەویناسی، ڕێ تێبردن، ئەندازە و تایبەتمەندیەکانیتری.

**غار- غار** / qārqār/ ☜ **قار- قار**

**غارنشین** / qārnešîn ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ئەشکەوتنشین؛ غارنشین؛ بە تایبەتمەندی یان ئۆگرەتی نیشتەجێ بوون لە ئەشکەوتدا ‹هنر مردم غارنشین: هونەری خەڵکی ئەشکەوتنشین›.

**غارنشینی** / qārnešînî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ئەشکەوتنشینی؛ غارنشینی: ١. لە نێو

ئەشکەوتدا ژیان ٢. قۆناغێک لە ژیانی سەرەتایی مرۆ کە خەڵک لە ئەشکەوتدا دەژیان.

**غارنوردی** / qārnavardî/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئەشکەوتەوانی؛ شکەوتوانی؛ نواوانی؛ کار و ڕەوتی ڕۆشتن بۆ ناو ئەشکەوت بە مەبەستی گەڕان، شتی تازە دۆزینەوە یان وەرزش.

**غاروغور** / qār-o-qûr/ ☜ **قار و قور**

**غاز** / qāz ، ـها/: [ترکی]/اسم. قاز؛ قازی؛ هەر یەکە لە پەلەوەرانی مەلەوان و پا پەڕەیی، بە جەستەی مامناوەندیەوە کە نێر و مێیان وەکوو یەکن و لە سەر زەوی هێلانە دەکەن.

▣ **غاز چراندن:** *[کنایی]* مێش گرتن/ خەساندن/ قەپاندن/ بژاردن؛ مل/ گون تەقاندن؛ خۆ خلافاندن لە بەر بەتالی و بێکاری ‹تو را چه به این کارها؟، بهتر است بروی غاز بچرانی: تۆ چت داوە لەم کارانە؟، باشترە بڕۆی مێش بگری›.

**غازپا** / qāzpā ، ـها/: [ترکی/ فارسی]/اسم. قازیاخە؛ قازیانە؛ قازیاوە؛ پاقازە؛ قازیاوە خوەشە؛ قازئاخە؛ لێشری؛ ئالفەگیایەکی لە تیرەی ئەسپەناخە.

**غازه** / qāze/:/اسم. *[قدیمی]* سوهراف؛ سوراف؛ سووراو؛ سووراڤک؛ غازە؛ دەرمانی سووری خۆ جوان کردن.

**غاسول** / qāsûl ، ـها/:/اسم. زریزانە؛ زیزانە؛ مرۆر؛ کەفێنە؛ دەرمانەدیان؛ گیایەکی ئالیکی یەکسالانە بە گەڵای دووبەدوو پێکەوە لکاو، کە لە قەراخی مەزرا و ڕێگا و بانەوە دەڕوێ، گەڵا و ساقەتە و ڕیشەی وشکەوە بووی لە ئاودا کەف دەکەن: **صابونی ـ٣**

**غاصب** / qāseb ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. داگیرکەر؛ بەزۆرسێن؛ دەستدرێژکەر؛ زۆرکار؛ بسێن؛ بستێن ‹می‌گویند او غاصب است و در این خانه هیچ حقی ندارد: وەک دەڵێن ئەو داگیرکەرە و هیچی بەسەر ئەم ماڵەوە نیە›.

**غاصبانه** / qāsebāne/: [عربی/ فارسی] قید. داگیرکەرانە؛ داگیرکارانە؛ زۆرکارانە؛ بەزۆری؛ بە شێوەی داگیرکاری ‹خانه‌ی مرا غاصبانه تصاحب کرد: داگیرکەرانە ماڵەکەمی لە چنگم دەرێنا›.

**غا ـ غا** / qāqā/ ☜ **قا ـ قا**

**غافت** / qāfes ، ـها/: [عربی]/اسم. گیاجگەر؛ ئەگریمۆنی؛ دەواجەرگە.

**غافل** / qāfel ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. ١. بێئاگا؛ بێهاگا؛ غافل؛ هێڤژاندی؛ باروتە؛ بێخەبەر و بێمبالات سەبارەت بە ڕووداوان ‹او نیت بدی دارد از او غافل نشو!: مرازێکی خراپی هەیە لێی بێئاگا مەبە!› ٢. نەزان؛ نیازان؛ خاویلکە؛ گێل؛ گەمژە؛ دەبەنگ؛ ڕەمتەلە؛ ڕەوتەلە؛ لە گوێگاداخەوتوو.

▣ **غافل شدن:** بێئاگا بوون؛ ئاگا لێبڕان/ نەمان؛ غافلان؛ غافڵ بوون؛ دوور بوونەوە لە وریایی و سەرنج لە کەس یان شتێک ‹یک لحظه از او غافل شدم، افتاد توی رودخانه: ساتێک لێی بێئاگا بووم، کەوتە نێو چۆمەوە›. هەروەها: **غافل بودن**

**غافلگیر** / qāfelgîr/: [عربی/ فارسی] صفت. غافڵگیر؛ بێئاگاداری؛ تووشی بار و دۆخی پێشبینی نەکراو هاتوو.

▣ **غافلگیر شدن:** غافڵگیر بوون؛ ئامادە نەبوون بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ڕووداوێکدا ‹با دیدن پدرش غافلگیر شد و نتوانست سیگار را پنهان کند: کە بابی دیت خافڵگیر بوو نەیتوانی جگەرەکەی بشارێتەوە›. هەروەها: **غافلگیر کردن**

**غافلگیرانه**[1] / qāfelgîrāne/: [عربی/ فارسی] صفت. کوتوپڕی؛ بە کتوپڕ؛ غافڵگیرانە؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی غافڵگیریەوە ‹عملیات غافلگیرانه برای به دام انداختن سارقان: چالاکی کوتوپڕی بۆ خستنە داوی دزەکان›.

**غافلگیرانه**[2]: *قید*. غافڵگیرانە؛ کوتوپڕ؛ ناگەهان؛ لەناکاو؛ بێتەقە ‹غافلگیرانه حمله کردند و سارقان را گرفتند: غافڵگیرانە هێرشیان برد و دزەکانیان گرت›.

**غافلگیری** / qāfelgîrî/: [عربی/ فارسی]/اسم. غافڵگیری: ١. دۆخ یان چۆنیەتی ڕووبەڕوو بوون دەگەڵ ڕووداوێکی کتوپڕی بە هۆی بێئاگایی و

سەرنج نەدانەوە ‹تغییر ناگهانی آب و هوا باعث غافلگیری همه شد: گۆڕانی لەنەکاوی کەش بوو بە هۆی غافڵگیری هەموان› ٢. هۆش لێبڕاوی؛ لە کوتوپڕا کەوتنە بار و دۆخێکی ڕەچاونەکراوەوە ‹از غافلگیری ما استفاده کرد و گریخت: کەلکی لە هۆش‌لێبڕاوی ئێمە گرت و دەرچوو›.

**غال** / qāl/ ☜ **قال**

**غالب** / qāleb/: [عربی] *صفت*. سەرکەوتوو؛ زاڵ؛ چیر؛ چێر؛ سوار؛ تهێل ‹تیم غالب: تیمی سەرکەوتوو›

▣ **غالب آمدن/ شدن:** سەرکەوتن؛ زاڵ/ چیر/ چێر/ تهێل/ سوار بوون ‹تیم کردستان بر حریف غالب آمد: تیمی کوردستان بە سەر هاوملەکەیدا سەرکەوت›.

**غالب** / qālebe/: [عربی] *حرف*. زۆربەی؛ زۆرتری؛ زۆرینەی؛ زۆراتی؛ فرەتری؛ زۆرمەی ‹غالب افراد: زۆربەی کەسان›.

**غالباً** / qāleban/: [عربی] *قید*. زۆرتر؛ بە زۆری؛ زۆرجار؛ زۆرکەڕەت؛ لە زۆر کاتدا؛ فرە ڕا؛ فرەتەر؛ فرەتر؛ فرەوجار؛ لە زۆر دەمدا ‹میوەها غالباً شیرین بودند: میوەکان زۆرتر شیرین بوون›.

**غالیدن** / qālîdan/: *مصدر. لازم. متعدی. [قدیمی]* □ *لازم*. ١. گلمان؛ پلکان؛ پەرخان؛ گەوزان؛ تلدان؛ تل خواردنەوە □ *متعدی*. ٢. گلماندن؛ گلملاندن؛ پلکاندن؛ پەرخاندن؛ گەوزاندن؛ تلاندنەوە؛ تلنەی؛ تلنای؛ پلکاندن؛ پلاندن؛ تل پێدان.

**غامض** / qāmez/: [عربی] *صفت*. ئاڵۆز؛ دژوار؛ ئاریشە؛ پێچەڵاوپێچ؛ پێچەڵپێچ؛ گران؛ سەخت ‹مسألەی غامض: گرفتی دژوار›.

**غان‌وغون** / qān-o-qûn/: *صوت*. گڕ و گاڵ؛ گغ و بڤ؛ گاڵ و بوغر؛ گاڵ و بوغ؛ دەنگ و قسەی زارۆی ساوا کە تازە زمان دەگرێ.

**غاوشنگ** / qāvšang/: *اسم*. ١. گارام؛ گارم؛ گاران؛ گارانە؛ گالۆک؛ تەیاخ؛ پەیاخ؛ پەیاغ؛ مساس؛ مساسک؛ مساسە؛ مەساسە؛ داردەستی جووتیار کە گاجووتی پێ لێدەخوڕن ٢. نەقیزە؛ زەخت؛ زەختە؛ شەبیک؛ داری میخ لە سەرێک کراو بۆ لێخوڕنی کەر و گا.

**غایات** / qāyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **غایت**

**غایب** / qāyeb/: [عربی] *صفت*. ١. ـها؛ ـان؛ ـین/ غایب؛ نەهاتوو ‹آزاد دیروز غایب بود: ئازاد دوێنێ غایب بوو› ٢. گوم؛ گم؛ ون؛ بزر؛ پێوار؛ بەرپێوار؛ نادیار؛ نەدیار؛ بەزرە؛ لە بەر چاو نەماو ‹در یک لحظه از جلو چشمم غایب شد: لە چاو نووقانێکدا لە بەر چاوم گوم بوو› ✱ **غائب**. هەروەها: **غایب بودن؛ غایب شدن**

**غایبانه**[1] / qāyebāne/: [عربی/ فارسی] *صفت*. لە دوورەوە؛ دووراودوور؛ غایبانە.

**غایبانه**[2]: *قید*. لە دوورەوە؛ دووراودوور؛ لە نەبوونی خۆدا؛ بێ بوونی خۆ؛ غایبانە ‹غایبانە محاکمه شد و محکومش کردند: لە دوورەوە دادگایی کرا و تاوانباریان کرد›.

**غایت** / qāyat ، ـها: غایات/: [عربی] *اسم*. ئەوپەڕ؛ دەرەنجام؛ گاڤین؛ هەدرەش؛ ئاخرین ڕادەی هەر شتێ ‹وقتی بدبختی بە غایت رسید: کاتێ چارەڕەشی گەیشتە ئەوپەڕی›.

**غایت‌شناسی** / qāyatšenāsî/: [عربی/ فارسی] ☜ **فرجام‌شناسی**

**غایط** / qāyet/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ڤڕۆ؛ پیسی؛ چەپەڵی؛ گوو: **غائط**

**غایله** / qāyele ، ـها/: [عربی] *اسم*. ئاژاولە؛ ئاژاوە؛ ئاژاولە؛ گاشە؛ کێشە؛ بشێوە؛ خارۆرە؛ هەرا ‹با نرمش و سیاست غایلە را خواباند: بە نەرم و نیانی ئاژاولەکەی کوژاندەوە›: **غائله**

**غایی** / qāyî/: [عربی] *صفت*. دوایی؛ دوایین؛ ئاخری؛ ئاخرین؛ دواگین؛ دومایین؛ دمایین؛ بنین؛ ئاخرینە؛ دمەین ‹هدف غایی: ئامانجی دوایی›: **غائی**

**غبار** / qobār ، ـها/: [عربی] *اسم*. تۆز؛ تەپ؛ تەم؛ تۆخ؛ ڕتام؛ خولە؛ خۆڵ؛ گەرد: ١. وردیلەی زۆر

ورد (بە تایبەت هی خاک) کە بە دەم باوە هەڵدەستێ ٢. *[مجازی]* ئەوی وەک تۆز لە سەر شتێک بنیشێ ‹غبار غم؛ غبار فراموشی: تۆزی خەم؛ تەمی لە بیر چوونەوە›.

**غبارآلود / qobārālûd/**: [عربی/ فارسی] *صفت.* تۆزاوی؛ تۆزاوین؛ تۆزین؛ تۆزاوتن؛ خۆڵاوی؛ خاکاوی؛ خۆڵینە؛ خوڵەین؛ وەلنە؛ وەلن؛ ڕتامی؛ تەپ و تۆزاوی؛ بە تەپ و تۆز یان تۆز و خۆڵ لە سەر نیشتوو ‹هوای غبارآلود: هەوای تۆزاوی›.

**غبارروبی / qobār.rûbî/**: [عربی/ فارسی]*/اسم.* تۆزتەکێنی؛ کار و ڕەوتی تەکاندن، سڕین و خاوێن‌کردنەوەی تەپ و تۆز لە سەر شتێ.

**غبطه / qebte**، ـها/: [عربی]*/اسم.* ئاواتخوازی؛ ئاواتەخوازی؛ ئاواتەوازی؛ مرێکاری؛ ئارەزوومەندی؛ ڕەوتی خۆزگە پێبردن/ خواردن؛ ئاواتی بە دەست هێنانی شتێک کە دەس نادا بەڵام کەسی‌تر هەیەتی ‹دیگران به جوانی و زیبایی او غبطه می‌خوردند: خەڵکی‌تر ئاواتخوازییان بە جوانی و لەباری ئەو بوو›. هەروەها: **غبطه خوردن**

**غبغب / qabqab**، ـها/: [عربی]*/اسم.* بەرچێڵە؛ بەرچیلە؛ بەرچەنە؛ بەرخەبەبە؛ خەبەبە؛ بەرکور؛ ژێر چەناگە؛ ژێر چەنە؛ شولەمە؛ غەبغەبە؛ غەوغەوە؛ گەوگەوە؛ گاوگ؛ بەبەغە؛ چۆلەمە؛ گۆشتی ژێر چەنە، کە لە مرۆی قەڵەوی بەتەمەندا شلک و شۆڕە.

**غبن / qabn/**: [عربی]*/اسم.* زەرەر؛ زیان؛ زان؛ خەسار؛ چۆنیەتی کڵاو سەر چوون لە مامەڵەدا بە بۆنەی نائاگایی یان ساویلکەییەوە.

**غثیان / qasayān/**: [عربی]*/اسم. [ادبی]* هێق؛ ئێق؛ ڕەوتی ڕشانەوە؛ هەڵاوردنەوە؛ قەڕشیان؛ هێنانەوە؛ قەی‌کردنەوە.

**غد / qod/** ☜ **قُد**

**غدار / qaddār/**: [عربی] *صفت. [ادبی]* بێ‌بەینەت؛ بێ‌بەڵێن؛ کامباخ؛ کەمباخ؛ پەیمان‌شکێن؛ غەددار ‹روزگار غدار: ڕۆژگاری بێ‌بەینەت›.

**غدد / qodad/**: [عربی] جمعِ ☜ **غدّه**

**غدر / qadr**، ـها/: [عربی]*/اسم. [ادبی]* بێ‌بەڵێنی؛ پەیمان‌شکێنی؛ بێ‌وەفایی؛ کامباخی؛ قەفر؛ غەدر.

**غده / qodde**، ـها؛ غدد/: [عربی]*/اسم.* لک؛ لوو؛ لۆ؛ لوی؛ لکە؛ مابەک؛ بەرزەک؛ برزک؛ لوک؛ لقک؛ مادە: ١. *[پزشکی]* گرێ؛ ئالگ؛ گومتیل؛ دوپشی؛ گرووز؛ توومۆر؛ کۆمەڵە شانەی نائاسایی کە لە ڕواڵەتدا لە شانەی ئاسایی دەچێ بەڵام بێ‌کەڵکە و بەدهیمەکەی پەلامار دەباتە سەر شانەکانی‌تر و پەرە دەستێنێ ‹زیر بغلش یک غده درآمده بود: لکێ لە بن باڵییەوە دەرهاتبوو› ٢. *[پزشکی]* دژێن؛ خوشخوشک؛ ڕژین؛ گلاند؛ ئەندام، شانە یان خانەی بەرهەمهێن و دەڵێنەری ماکی کیمیایی تایبەت ‹غدّەی اشکی: لووی فرمێسک› ٣. *[زیست‌شناسی]* هەر جۆرە ئەندامێکی دەڵێنەر (وەک کیسەی شیلە لە گیادا) ٤. خڕ؛ هەر پێکهاتەیەکی وەک لک.

▣ **غدەی اشکی:** لوو/ دژێنی فرمێسک؛ کیسەئاسایەک پڕ لە فرمێسک لە گۆشەی دەرەوەی چاو لە ژێر پێلوودا، بۆ تەڕ ڕاگرتنی چاو.

**غدەی باز** ☜ **غدەی برونریز**

**غدەی برونریز:** لوو/ دژێنی دەرڕێژ؛ ڕژێنێ کە دەڵاوەکەی لە دەراوێکەوە دەڕژێتە دەرەوەی لەش: **غدەی باز**

**غدەی بزاقی:** لوو/ دژێنی لیک؛ دژێنی لیک‌ڕێژ لە بن‌گوێ، بن‌شەویلە و ژێر زماندا کە لە ماردا دەبێتە کیسەی ڕژاندنی ژار.

**غدەی بسته** ☜ **غدەی درونریز**

**غدەی تناسلی** ☜ **غدەی جنسی**

**غدەی جنسی:** لوو/ دژێنی زایەندی؛ ئەندامی بەرهەمهێنەری ماکی زایەندی، کە لە برێ گیاندارانــدا هورمــونیش دەر دەدات: **غدەی تناسلی**

**غده‌ی درونریز:** لوو/ دژێنی ناوڕێژ؛ ڕژێنێ که هورمون دروست ده‌کا و گشت یان به‌شێکی ده‌ڕژێته نێو خوێن و له خوێنه‌وه ده‌گاته ئه‌ندامی خۆی و کاردانه‌وه‌یه‌ک به‌دی دێنێ: **غده‌ی بسته**

**غده‌ی زیرزبانی:** لوو/ دژێنی ژێرزمانی؛ جووتێک ڕژێنی لیکه له ژێر زماندا.

**غده‌ی زیرزمینی:** سه‌لک؛ سه‌لکه؛ سه‌رک؛ لکی بنه‌رزی؛ بنی هه‌ڵتۆقاوی ڕیشه و لاسکی ژێر زه‌ویدا.

**غده‌ی عرق:** لوو/ دژێنی ئاره‌ق؛ ڕژێنی بن‌پێستی گوانداران که ئاره‌ق ده‌رده‌دا.

**غده‌ی فوق کلیه:** لوو/ دژێنی سه‌روڵک؛ جووتێک لووی ناوڕێژ که له برپڕه‌داراندا ده‌که‌وێته سه‌ر هه‌ردووک گورچیله‌وه.

**غدیر** / qdîr/ [عربی] ☜ عید غدیر، **عید**

**غذا** / qazā ، ـها؛ اغذیه/: [عربی]/اسم. خۆراک؛ خه‌وه‌راک؛ خواردن؛ خواردنی؛ وارده؛ بژیو: ۱. غه‌زا؛ خوارده‌مه‌نی؛ وارده‌مه‌نی؛ هه‌رچیک بخوری ‹غذای خرگوش هویج است: خۆراکی که‌روێشک گێزه‌ره› ۲. چێشت؛ چشت؛ چاشتی؛ گرار؛ گیرمی؛ گێرمی؛ گرارا؛ ئه‌وه‌ی وه‌ک خواردنێکی سه‌ره‌کی (تاشت، فراوین و شێو) ده‌خوری و زیاتر تێکه‌ڵێک له چه‌ند خوارده‌مه‌نیه ‹تا یک ماه غذای ما شده بود نان و دوغ: تا مانگێک خواردنمان هه‌ر نان و دۆ بوو›.

⊡ **غذای روح:** /مجازی/ ئارامی گیان؛ سوکنایی دڵ؛ خۆراکی گیان؛ هۆی خۆشی و دڵنیایی.

⊡ **غذا کشیدن:** چێشت/ غه‌زا تێ‌کردن؛ چاشته‌ره که‌رده‌ی؛ چێشت داکردن بۆ دانان له سه‌ر سفره.

**غذائی** / qazā'î/: [عربی] ☜ **غذایی**

**غذائیت** / qazā'îyyat/: [از عربی]/اسم. بژیه‌نی؛ دۆخ و چۆنیه‌تی خۆراک، له باری بایه‌خی خۆراکیه‌وه ‹غذائیت گوشت خیلی زیاد است: گۆشت بژیه‌نێکی باشه›.

**غذاخوری**[1] / qazāxorî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. چێشتخانه؛ خواردنگه؛ شوێنی تایبه‌ت بۆ خواردن و خواردنه‌وه به پاره (وه‌ک کافه، قاوه‌خانه، ڕه‌ستوران و ...).

**غذاخوری**[2]: *صفت.* چێشتخۆری؛ غه‌زاخۆری؛ چاشتوارده‌ی؛ پێوه‌ندیدار یان سه‌ر به نان خواردن ‹میز غذاخوری: مێزی چێشتخۆری›.

**غذایی** / qazāyî/: [عربی] *صفت.* خۆراکی؛ پێخۆری؛ چێشتی؛ وه‌رکوت؛ سه‌ر به خۆراک ‹مواد غذایی؛ کمک غذایی: ماکی خۆراکی؛ یارمه‌تی خۆراکی›: **غذائی**

**غر** / qor/: *اسم. [گفتاری]* ۱. ـها/ بۆڵه؛ بۆڵه‌بۆڵ؛ پرته؛ پرته‌پرت؛ خوته؛ خوته‌خوت؛ قۆڕ؛ قوته؛ خوته‌وبۆڵه؛ گازه؛ لنده؛ پرته‌وبۆڵه؛ قسه‌یه‌ک به نیشانه‌ی وه‌ڕه‌زی یان دڵئێشاوی که له‌به‌ر خۆوه ده‌گوترێ و که‌سی تێ‌ناگا: **غرـ غر** ۲. ☜ **قُر**

⊡ **غر زدن:** بۆلاندن؛ بۆڵه‌بۆڵ کردن؛ پرته‌وبۆڵه کردن؛ بۆڵه‌نه‌ی؛ بۆڵنای؛ قۆڕه‌قۆڕکردن؛ وه‌ڕه‌زی یان دڵئێشاوی خۆ ده‌ربڕین ‹مرتب غر می‌زد که چرا کار را راه نمی‌اندازید: هه‌ر ده‌یبۆلاند که بۆ کاره‌که ڕێ‌ناخه‌ن›: **غرـ غرکردن**

**غرا** / qarrā/: [عربی] *صفت. [ادبی]* به‌قه‌وه‌ت؛ به‌برشت؛ سه‌رنجڕاکێش؛ شاراندی (ته‌نیا له‌مه‌ڕ وتاربێژی و قسه کردنه‌وه به کار ده‌ڕوا) ‹نطق غرا: وتاری به‌برشت›.

**غرائب** / qarā'eb/: [عربی] ☜ **غرایب**

**غرائز** / qarā'ez/: [عربی] ☜ **غرایز**

**غراب** / qorāb/: [عربی]/اسم. ۱. ـها/ ☜ **کلاغ سیاه** ۲. *[نجوم]* وێنه‌یه‌کی گه‌ردوونی و که‌م‌تیشک له ئاسمانی باشووری که بریتی له چوار ئه‌ستێره‌یه.

**غرابت** / qarābat ، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ۱. سه‌یری؛ سه‌رسووڕماوی ۲. *[نامتداول]* بێگانه‌یی؛ نامۆیی؛ غه‌واره‌یی.

**غراره** / qarāre ، ـها/: [معرب از کردی]/اسم. *[قدیمی]* خەرار؛ خرار؛ خەشە؛ جەواڵی لە موو.

**غرامات** / qarāmāt/: [عربی] جمعِ ☜ **غرامت**

**غرامت** / qarāmat ، ـها؛ غرامات/: [عربی]/اسم. تاوان؛ تاوانە؛ سەوس؛ خورۆمە؛ پووڵێ کە لە جیاتی خەسار دەدرێ یان وەردەگیردرێ.

**غرامت‌نامه** / qarāmatnāme/: [عربی/ فارسی] ☜ **تاوان‌نامە**

**غران**[1] / qorrān/: صفت. بەگوڕە؛ بە نەڕە؛ بەگرمە؛ بەگرمە و هۆڕ؛ بە خوو یان لێهاتوویی نەڕاندن ‹شیر غرّان: شێری بەگوڕە›.

**غران**[2]: قید. بەگرمە؛ بەگوڕە؛ بەگوڕەگوڕ؛ بەگرمەگرم؛ بە نەڕەنەڕ ‹سیل غرّان و خروشان پیش می‌تافت: لافاو بەگرمە و هۆڕەوە و لنگی دەدا›.

**غرایب** / qarāyeb/: [عربی] جمعِ ☜ **غریب؛ غرائب**

**غرایز** / qarāyez/: [عربی] جمعِ ☜ **غریزه؛ غرائز**

**غرب** / qarb/: [عربی]/اسم. ڕۆژاوا؛ ڕۆژاڤا؛ ڕۆئاوا؛ هۆراوا؛ خۆراوا؛ خۆرئاوا؛ خۆرنشین؛ خوەرپەڕان: ۱. یەکێک لە چوار لای سەرەکی کە خۆر لەوێوە ئاوا دەبێ ۲. ولاتانی ڕۆژاوا: *الف) [مجازی]* ناوی گشتی ولاتانی ئورووپایی و ئەمریکایی *ب)* بەشێک لە گۆی زەوین کە دەکەوێتە لای ڕۆژاوای هێڵی نیوەڕۆی گرینویچەوە.

**غربا** / qorabā/: [عربی] جمعِ ☜ **غریبه**

**غرباً** / qarban/: [عربی]/قید. لە ڕۆژئاواوە؛ لە ڕۆژاوادا؛ لە لای خوەرنشینەوە ‹غرباً محدود است به رودخانه: لە ڕۆژئاواوە دەگاتە ڕووبار›.

**غربال** / qarbāl ، ـها/: [عربی]/اسم. کارماخ؛ کەو؛ کەمە؛ کەم؛ کاکێژ؛ گلگیر؛ کەرستەی دابێژتن؛ کەرستەی کونکون بۆ جیا کردنەوەی درشت لە ورد؛ هێڵەگێک بە کونی درشتەوە: **غربیل**

⊡ **غربال** شدن: دابێژران؛ بێژران: ۱. وێژیان؛ شەردین؛ لە بێژنگ دران؛ لە هێڵەک دران؛ دابێژان؛ وێژان؛ بێژان؛ وێچیەی؛ جوێ بوونەوەی ورد لە درشت بە بێژنگ، کەو یان... ۲. *[مجازی]* وەلانرانی نالەبار لە کۆمەڵێک ‹در عرض یک هفته افراد نامناسب غربال شدند و در کلاس فقط ۱۲ نفر ماندند: لە حەفتەیەکدا گەند و گۆتاڵ دابێژران و تەنیا ۱۲ کەس لە کەلاسدا مانەوە›.

**غربال‌بند** / qarbālband ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. ۱. بێژنگەر؛ بێژنگ‌ساز؛ کەوپێچ؛ کەسێ کە کاری دروستکردنی بێژنگە ۲. *[مجازی]* قەرەچی؛ کۆلی؛ کاولی؛ کاولی * **غربیل‌بند**

**غربت** / qorbat/: [عربی]/اسم. ۱. دووروەلات؛ دوورولات؛ غوربەت؛ جێگەی دوور لە زێدی کەسێک ۲. غەریبی؛ دوورولاتی؛ دووروەلاتی.

**غربتی** / qorbatî ، ـها/: [عربی] صفت. *[تعریض، گفتاری]* نامۆ؛ نەناس؛ نەشناس؛ بێگانە.

**غرب‌زدگی** / qarbzadegî/: [عربی/ فارسی]/اسم. ڕۆژاوابردەیی؛ ڕۆژاوابردوویی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕۆح چوون و هەڵخەڵەتان بە ڕواڵەت و زەرق و بەرقی ڕۆژاوا.

**غرب‌زده** / qarbzade ، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕۆژاوابردە؛ ڕۆژاوابردوو؛ تووشی هورووژمی ڕامیاری، فەرهەنگی یان ئابووری ولاتانی ڕۆژاوا.

**غرب‌ستیزی** / qarbsetîzî/: [عربی/ فارسی]/اسم. کار یان ڕەوتی دژایەتی‌کردن لەگەڵ دەسەلاتی ڕامیاری یان بایەخگەلی کۆمەلایەتی ڕۆژاوادا. هەروەها: **غرب‌ستیز**

**غرب‌گرایی** / qarbgerāyî/: [عربی/ فارسی]/اسم. هۆگری و شۆنەڕایی لە شێوازی ژیان، بایەخی فەرهەنگی یان ڕوانگەی ڕامیاری ڕۆژاوا. هەروەها: **غربگرا**

**غرب‌محوری** / qarbmehvarî/: [عربی]/اسم. دۆخ و چۆنیەتی هەڵسەنگاندنی هەموو بایەخ و فەرهەنگێک بە پێی سەنگ و پێوانەی ڕۆژاوا. هەروەها: **غرب‌محور**

**غربی** / qarbî/: [عربی] صفت. ڕۆژاوایی؛

ڕۆژئاڤایی؛ ڕۆژاوایىنە: ١. /ـها؛ ـان/ پێوەندیدار یان سەر بە ڕۆژئاواوە ‹موسیقی غربی: مۆسیقای ڕۆژئاوایی› ٢. لە ڕۆژئاوادا ‹کشور غربی: ولاتی ڕۆژئاوایی›.

**غربیل** / qarbîl/: [از عربی] ☜ **غربال**

**غربیل‌بند** / qarbîlband/: [از عربی/ فارسی] ☜ **غربال‌بند**

**غربیلک** / qarbîlak ، ـها/: [از عربی/ فارسی] /اسم. ئاڵقە/ کەمەی فەرمان؛ کەرستەی پێ هەڵسوڕانی ماشێن بۆ بە ڕاست یان چەپدا چوون.

**غرس** / qars/: [عربی] /اسم. [ادبی] فەرک؛ کار یان ڕەوتی نان؛ ناشتن؛ چاندن؛ چەقاندن؛ ڕۆنایش؛ نایش‌ڕۆ؛ چۆکانن؛ نیانی دار یان نەمام ‹به مناسبت روز درختکاری هزار نهال را در سقز غرس کردند: بە بۆنەی ڕۆژی دارنیانەوە هەزار نەمامیان لە سەقزدا نا›.

**غرش** / qorreš ، ـها/: /اسم. گوڕڕە؛ گوڕە؛ گوڕ؛ گورمژ؛ گورمە؛ گرمە؛ نەڕە؛ نارە؛ مرە؛ مەڕژ؛ تاف؛ تەندوورە؛ خومخوم؛ گوڕە و هاڕە؛ نەعرەتە ‹غرش تندر؛ غرش شیر: گرمەی هەور؛ گوڕڕەی شێر›.

**غرض** / qaraz ، ـها/: [عربی] /اسم. ١. نیاز؛ مەبەست؛ هەنگێزە؛ مەبەستی نهێنی ‹غرض من این است که شاید بتوانم کمکی بکنم: مەبەستم ئەوەیە بەڵکوو بتوانم یارمەتییەک بدەم› ٢. /اغراض/ [مجازی] قین؛ ڕق؛ غەرەز؛ جونگ؛ دوژمنایەتی ‹او نسبت به من غرض دارد: ئەو قینی لە منە›.

**غرض آلود** / qarazālûd/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕقاوی؛ قیناوی؛ وێڕای خواست و نیازی نهێنی و پتر ناڕەوا ‹کسی به این حرفهای غرض‌آلود توجه نمی‌کند: کەس گوێ بەم قسە ڕقاویانە نادا›.

**غرض‌ورزی** / qarazvarzî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. ڕقەبەرایەتی؛ قینبەرایەتی؛ ڕقەبەری؛ ڕکەبەری؛ قین و قینکاری؛ دووری لە ڕاستی و دروستی لە بەر دژمنایەتی کەسێک یان لایەنگری لە کەسێکی تر ‹او به غرض‌ورزی مشهور است: لە ڕقەبەرایەتیدا بە ناوبانگە›.

**غرغر** / qorqor/ ☜ **غُر**

◘ **غرغر کردن** ☜ غر زدن، **غُر**

**غرغرو** / qorqorû ، ـها/: صفت. [گفتاری] بۆڵەکەر؛ گازەکار؛ خوتە و بۆڵەکەر؛ بۆڵەبۆڵ‌کەر؛ فێر بووی ناڵین و ناڕەزایەتی دەربڕین: **قرقرو**

**غرغره** / qerqere, qarqare/: [عربی] /اسم. غەرغەرە؛ غەرغەرە: ١. کاری ئاو یان تراوی دەرمان لە دەم و گەروو وەردان و شۆردنی قوڕگ و بن‌زار ‹شبها پیش از خواب غرغره کنید: شەوان پێش خەو غەرغەرە بکەن› ٢. تراوی تایبەت بۆ شۆردنی دەم و گەروو ‹برایتان غرغره هم نوشته‌ام: غەرغەرەشم بۆ نووسیون›.

◘ **غرغره کردن**: ١. غەرغەرەکردن؛ ئاو لە دەم و گەروو وەردان ‹شبها غرغره می‌کرد: شەوانە غەرغەرەی دەکرد› ٢. [مجازی] کاوێژکردن؛ لاژەلاژکردن؛ ڕینگانەوە؛ دووپات‌کردنەوەی قسەی بێ‌سەرەوبەرە و بێ‌مانا.

**غرفه** / qorfe ، ـها/: [عربی] /اسم. چاوە؛ هەر کام لە باجە، مێز، هۆدە، ژوور یان هۆڵەکانی پیشانگایەک کە بۆ ڕانانی کالایەکی تایبەتی تەرخان کراوە ‹غرفه‌ی کتاب‌های دانشگاه کردستان: چاوەی کتێبانی زانستگای کوردستان›.

**غرق** / qarq/: [عربی] صفت. نوقم؛ نقوم؛ نقم؛ نقووم؛ قوم؛ نخرۆ؛ نووق؛ نۆق؛ نقۆ؛ نقوو؛ نۆقا؛ قیپ؛ چۆم؛ نقور؛ نوقمەسار: ١. ژێرئاوکەوتوو بە جۆرێ کە ئیتر دەرچوونی نەبێ ‹غرق شدن کشتی: نقوم بوونی کەشتی› ٢. [مجازی] خلتان؛ خەڵتان؛ خلپان؛ خەڵپان؛ قەلوای؛ بە تەواوی لەگەڵ شتێکدا تێکەڵ بووگ ‹لباسش غرق خون بود: گنجەکەی خلتانی خوێن بوو› ٣. [کنایی] یەکجار دەسەویەخە یان گیرۆدەی شتێک ‹غرق کار: نوقمی کار› ٤. [کنایی] تووشیاری ئەوپەڕی

کارتێکەری شتێک ‹غرق لذّت: نوقمی خۆشی›.

◘ **غرق شدن:** قوم/ قووم بوون؛ نووقان؛ نقوم بوون؛ نقووم بردن؛ نقم بیەی: ١. نوقمەسار بوون؛ ڕۆچوونە ناو تراوێک و دەرنەهاتنەوە ٢. *[کنایی]* زۆر لە بەر شتێکدا بوون ‹غرق آن افکار پریشان شدم: نوقمی ئەو بیرە ناسۆرانە بووم›.

هەروەها: **غرق کردن**

**غرقاب** / qarqāb/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* گێژاو؛ گێژنگە؛ گێژگێژاو؛ گێژینە؛ گۆم؛ گۆمژ؛ گێجیێ؛ تەنوورە؛ گەراف؛ گەڕاڤ؛ زڤرەک؛ زڤرک؛ زڤرۆک؛ ڤز؛ شوێنێک لە ئاو کە لە بەر قووڵی سووڕ دەخوا و بۆ خوارەوە دەکشێ و شیمانەی تێدا نوقم بوون زۆرە.

**غرقدره** / qarqdarre/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* دۆڵێ کە بە هۆی تەپینی زەوی یان هەڵکشانی ئاو، چووبێتە ژێر ئاو.

**غرقه** / qarqe/: [عربی/ فارسی] *صفت.* نوقم؛ نوقوم؛ نووقووم؛ نقم؛ قووم؛ نخرۆ؛ نوگوم؛ نگوم؛ نگم؛ نووقاو؛ خنکاو؛ خنکیاگ؛ نوقمەسار؛ سەرنقۆت.

**غرمبیدن** / qorombîdan/ ☜ **غرنبیدن**

**غرنبیدن** / qoronbîdan, qorombîdan/: *مصدر. لازم.* // **غرنبیدی:** گرماندت؛ **می غرنبی:** دەگرمێنی؛ **بغرنب:** بگرمێنە// گرماندن؛ گرمانن؛ گورماندن؛ گرمین؛ گوڕین؛ گرمنەی؛ گرمنای؛ هرمین؛ هوڕمین؛ شقین؛ هاڕەکردەی؛ خوڕین؛ خورمین؛ شرێخنەی؛ شرێخنای؛ گرموهۆڕکردن؛ لرمەکردن؛ گرمە کردن؛ شریخاندن؛ وەک هەورەگرمە یان بووم دەنگ لێ‌هەڵسان:

**گرنبیدن؛ گرمبیدن؛ غرمبیدن**

**غروب**[1] / qurûb, qorûb/: [عربی]/*اسم.* ١. ـها/ خۆرنشین؛ ڕۆژئاوا؛ ڕۆژاوا؛ ڕۆژاڤا؛ هۆراوا؛ زەردەپەڕ؛ زەردەلپەڕ؛ ڕۆژپەڕ؛ وێرە؛ وێرەگا؛ وێرگە؛ خۆراوا؛ خوەراوا؛ خروو؛ ئەنگۆرێ؛ ئەنگۆرە؛ تەنگی نوێژی شێوان؛ کۆتایی ڕۆژ، لە نیشتنی هەتاو تا تاریک بوونی هەوا ‹غروب دلربای دریا: خورنشینی دلڕفێنی زەریا› ٢. ڕەوتی ئاوا بوون؛ گوم بوونی تەنگەلی ئاسمانی لە ئاسماندا ‹غروب ماه: ئاوابوونی مانگ› ٣. *[کنایی]* دوایی؛ ئاخر و ئۆخر؛ دۆخ یان چۆنیەتی بڕانەوە و تەواو بوونی ڕەوتێک ‹غروب زندگی: دوایی ژیان›.

◘ **غروب شدن:** خۆر ئاوا بوون؛ ڕۆژاوا بوون؛ خۆرنیشتن؛ خوەراوا بوون؛ ئێوارە بوون؛ وێرەگا بیەی ‹عجله کن غروب شد: خێرا کە خۆر ئاوا بوو›.

**غروب کردن:** ئاوا بوون؛ ئاڤا بوون؛ وەر پڕەی؛ نیشتن؛ نیشتەی؛ داووسیان؛ پێوار بوونی تەنی ئاسمانی لە ئاسۆی ئاسماندا.

**غروب**[2]: *قید.* ئێوارە؛ هێوارە؛ هێڤار؛ ئێڤار؛ خۆراوا؛ زەردەپەڕ؛ هۆراوا؛ خۆرنشین؛ ڕۆژپەڕ؛ وێرەگا؛ خوەراوا؛ ئەنگۆرێ؛ ئەنگۆرە؛ هەنگۆر؛ هەنگۆرە؛ هەنگڤار؛ لە کاتی ڕۆژ ئاوا بووندا ‹غروب بیا پولت را بگیر!: ئێوارە وەرە پارەکەت وەرگرە!›.

**غرور** / qurûr, qorûr/: [عربی]/*اسم.* ١. هەستی سەربەرزی، هەڤیازی یان خۆشحاڵی کە بە بۆنەی دەستکەوتنی شتێک بەدی دێت ٢. سەرفەرازی؛ سەربەرزی؛ هورم و بایەخێک کە شیاوە هەر کەسێک بۆ خۆی دایبنێ ٣. *[مجازی]* خۆبینی؛ خۆبەزلزانی؛ خۆپەسەنی؛ قۆڕەدەماخی؛ گەڤەزەیی؛ دەمار؛ گەوەزەیی؛ فیس؛ فیز؛ قوبز؛ بایی؛ هەوا؛ کیمخا؛ بستەهی؛ قاپانی؛ لووتبلندی؛ لووتبەرزی؛ مەنەر؛ ئاخایۆکی؛ کەپ ‹غرور برش داشته بود و دیگر خدای خودش را هم بنده نبود: خوبینی کەوتبووە سەری و تازە خودای خۆشی بە حەق نەدەناسی›.

◘ **غرور ملی:** سەرفەرازی نەتەوەیی؛ هەستی ڕێز و سەربەرزی بە بۆنەی لێهاتوویی و بایەخی گەلی خۆوە.

**غرورآفرین** / qurûrāfarîn, qorûr-/ ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* سەربەرزیهێن؛ سەرفرازیدەر؛ بەدیهێنەری هەستی

بەرزەدەماخی و شانازی.

**غرورآمیز** / qurûrāmîz, qorûr-/: [عربی/ فارسی] *صفت.* سەرفەرازانە؛ سەربەرزانە؛ سەربڵندانە؛ وێڕای هەستی سەربەرزی و بەرزەدەماخی ‹رفتار غرورآمیز: ئاکاری سەرفەرازانە›.

**غرورانگیز** / qurûrangîz, qorûr-/: [عربی/ فارسی] *صفت.* سەربەرزکەر؛ بە دۆخ یان چۆنیەتیەک کە هۆی بزواندنی بەرزەدەماخی بێ ‹پیروزی غرورانگیز: سەرکەوتنی سەربەرزکەر›.

**غرولند** / qor-o-lond، ـها/: *اسم [گفتاری]* بۆلەبۆڵ؛ پرتەوبۆڵە؛ کوفەنی؛ بڕمە؛ بڵمە؛ ورتە؛ پرتە؛ ختە؛ خوتەوبۆڵە؛ پرتەپرت؛ لووتوپووت؛ لووتەلووت؛ مق‌ـمق؛ ڕینگە؛ ڕنگەڕنگ؛ فرتە؛ پتەپت؛ ڕیوەڕیو؛ پت؛ پت‌ـپت؛ وت‌ـوت؛ ختەخت؛ پرتەپرت؛ نق؛ بۆمە؛ بڵمەبڵم؛ برمەبرم؛ خوتەخوت؛ خت‌خات؛ ڕینگەڕینگ؛ وردەقسەی بە تووڕەیی یان دڵمەندی لە بن لێوەوە.

⊡ **غرولند کردن:** بۆلاندن؛ بۆلانن؛ بڵماندن؛ فلتاندن؛ فرتاندن؛ بۆلنەی؛ بۆڵنای؛ کورکان؛ کورکاندن؛ کورکانن؛ پرتە و بۆڵە کردن؛ ورتەورت کردن؛ کورکیان؛ گمایش؛ پرتاندن؛ ملنایەنە؛ چووقین؛ مرژاندن (بۆ سەگ)؛ مڕاندن (بۆ سەگ). هەروەها: **غرولند شنیدن**

**غره** / qarre/: [عربی] *صفت.* پشت‌ئەستوور؛ پشت‌گەرم؛ لە خۆ بایی؛ غەڕە؛ بایی‌هوا ‹او به برادرش غره بود و فکر می‌کرد می‌تواند هر کاری بکند: بە براکەی پشت‌ئەستوور بوو، وای دەزانی دەتوانێ هەموو کارێک بکا›.

**غره** / qorre/: [عربی] *اسم.* ۱. مانگی نوێ؛ مانگی تازە ۲. سەرەتای مانگی هەیڤی ‹غُرّه‌ی ماه شعبان: سەرەتای مانگی شابان›.

**غریب** / qarîb/: [عربی] *صفت.* ۱. /غرایب/ سەیر؛ سەمەرە؛ سەمەر؛ سەرسووڕێن؛ سەرسووڕێنەر؛ سەرسامکەر؛ هەژەند؛ سۆزەرەت؛ سەرزڤڕێن ‹رفتارش غریب بود و توجه همه را جلب می‌کرد: ئاکاری سەیر بوو، سەرنجی هەمووی ڕادەکێشا› ۲. /ـان/ نەشناس؛ نەناس؛ نەژناس؛ نامۆ؛ نائاشنا؛ غەریب ‹توی آن شهر غریب و بی‌کس بود: لەو شارەدا نەشناس و بێ‌کەس بوو›.

**غریب‌گز** / qarîbgaz، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* غەریب‌گەز؛ چەشنێ گەنە کە چز پێوەدانی لە کەسانی نامۆدا دەبێتە هۆی یاو و نەخۆشی.

**غریبگی** / qarîbegî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* نامۆیی؛ غەریبی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەناس بوون.

**غریب‌نوازی** / qarîbnavāzî، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* غەریبداری؛ کار و ڕەوتی ڕاگرتن و خزمەت‌کردنی نامۆیان. هەروەها: **غریب‌نواز**

**غریبه** / qarîbe، ـها/: [عربی] *صفت.* نەناس: ۱. نامۆ؛ غەوارە؛ هاقی ‹در آنجا غریبه بود و کسی را نمی‌شناخت: دەوێدا نامو بوو، کەسی نەدەناسی› ۲. /غربا/ بیانی؛ بیانە؛ نەناسراو؛ نەناسیاو؛ غەریبە ‹آدم غریبه را به خانه راه نده!: دەرگا لە مرۆی بیانی مەکەوە!›.

**غریبی** / qarîbî/: [عربی] *اسم.* غەریبی؛ نەناسیاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نامۆ بوون.

⊡ **غریبی کردن:** غەریبی/ نامۆیی‌کردن: ۱. بە هۆی کەس‌نەناسینەوە، بێ‌تاقەت و دڵتەنگ بوون ۲. بە هۆی نەناسینی شوێن و جێگای دەور و بەرەوە، مات و کز بوون و دوورگرتن.

**غریدن**/ qorrîdan/: *مصدر. لازم.* // **غریدی:** نەڕاندت؛ **می غرّی:** دەنەڕێنی؛ **بغر(غرش کن):** بنەڕێنە// نەڕاندن؛ نەڕانن؛ نەڕان؛ گرمان؛ گرماندن؛ گرمانن؛ گرمین؛ گورمین؛ گوڕاندن؛ گوڕران؛ گوڕان؛ گومین؛ مەڕژین؛ هرمژاندن؛ گوڕژان؛ هرمژین؛ گوڕژین؛ گورمژین (بۆشێر)؛ مڕان؛ مڕاندن؛ مڕانن؛ خوڕیان؛ گومگومین؛ نەڕەی؛ نەڕای؛ نڕڕین؛ دەنگی بۆڕ و بەرز دەرهێنان.

■ صفت فاعلی: **غرّنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **غریده** (ـ)/ مصدر منفی: **نغرّیدن** (نەنەڕاندن)

**غریزه** / qarîze ، ـها؛ غرایز/: [عربی]/اسم. **خۆماک**؛ غەریزە: ۱. توانایی، لێهاتووی و باری سروشتی یان میراتی لە هەر شتێکدا ۲. هۆکاری سروشتی یان ژینیتیکی بۆ کردەوە و کاردانەوەگەلی خۆبەخۆیی.

**غریزی**[1] / qarîzî/: [عربی] صفت. خۆماکی؛ غەریزی؛ پێوەندیدار یان سەر بە غەریزەوە ‹عمل غریزی: کاری خوماکی›.

**غریزی**[2]: قید. خۆماکی؛ غەریزی؛ بە بۆنەی غەریزەوە ‹او غریزی عمل می‌کرد: خوماکی دەجوولاوە›.

**غریق** / qarîq/: [عربی] صفت. نقوم؛ نوقوم؛ نوقمەسار؛ نوقمبوو: ۱. خنکاو؛ نووقاو ۲. *[کنایی]* یەکجار نزیک و تێکەڵاوی شتێک ‹غریق رحمت: نوقمی ڕەحمەت›.

**غریو** / qarîv/: اسم. هارە؛ گوڕە؛ هەرا؛ گرمە؛ هاوار؛ هۆل؛ زەنا؛ نەڕە؛ قریپ؛ هەرا و هاوار؛ دەنگی بەرز و بە هەیبەت ‹غریو رودخانە: هارەی چەم›.

**غزا** / qazā/: [عربی] اسم. *[ادبی]* غەزا؛ شەڕ بۆ موسڵمان کردنی خەڵک.

**غزال** / qazāl ، ـها؛ ـان/: [عربی] اسم. کەژاڵ؛ خەزاڵ؛ کەژەڵ؛ غەزاڵ؛ مەراڵ؛ ئاسک؛ ئاس؛ مامز؛ کارمامز؛ مامبز؛ بانبز؛ ئاهوو؛ ئاهی؛ مەبرە؛ جەیران؛ گیانداریکی گوانداری گیاخۆری جووت سمە، بە قەد بزنێک دەبێ، دەست و پێی بڵند و باریک و لەشی کەمتووکە.

**غزل** / qazal ، ـها؛ غزلیات/: [عربی] اسم. غەزەڵ: ۱. هەڵبەستەیەک پتر بە ۷ تا ۱۳ بەیتەوە، هەموو لە سەر یەک کێش و یەک سەروا ۲. شیعری ئەویندارانە.

◘ **غزل خداحافظی را خواندن**: *[کنایی]* **مالاوایی** یەکجاری کردن؛ ڕوو کردنە ڕەشەبا؛ بۆ هەمیشە چوون یان مردن ‹شاعر ما هم غزل خداحافظی را خواند: شاعیری ئێمەش مالاوایی یەکجاری کرد›.

**غزلسرا** / qazalsarā ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] صفت. غەزەڵبێژ؛ غەزەڵهۆن ‹شاعر غزلسرا: شاعیری غەزەڵبێژ›. هەروەها: **غزلسرایی**

**غزلیات** / qazalîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **غزل**

**غزنوی** / qaznavî/: [عربی] صفت. غەزنەوی؛ پێوەندیدار یان سەر بە غەزنە (غەزنەین) لە ئەفغانستان.

**غزوات** / qazavāt/: [عربی] جمعِ ☜ **غزوه**

**غزوه** / qazve ، ـها؛ غَزَوات/: [عربی] اسم. غەزوە؛ هەر یەکە لە شەڕەکانی پەیغەمبەری ئیسلام لەگەڵ دوژمناندا.

**غژب** / qojb/: اسم. بۆڵ؛ بۆڵە؛ گەبەڵ؛ گلارە؛ دەنکەترێ؛ لبەترێ؛ گلوەترێ؛ بۆڵە هەنگوور؛ تلیاترێ.

**غژ ـ غژ** / qejqej/: صوت. قژـقژ؛ قژەڤژ؛ ژەوژ؛ کرچەکرچ؛ قرچەقرچ؛ دەنگی خولانەوەی شتێک لە سەر تەوەرەی خۆی (وەک لاولا یان چەرخ و...): **قژـ قژ**

**غژگاو** / qajgāv/: اسم. غەژگا؛ گای زلی ناوچەی تەبەت و بەرزاییەکانی ئەو وڵاتە، بە ڕەنگی قاوەیی مەیلەو ڕەش، کەویەکانی جەستەیان چکۆلەترە و باریشیان پێ دەکێشن: **یاک**

**غسال** / qassāl ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. مردووشۆر؛ مردەشۆر؛ مەردەشۆر؛ کەسێک کە مردوان دەشوات.

**غسالخانه** / qassālxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. مردووشۆرخانە؛ مردەشۆرخانە؛ مەردەشۆرخانە؛ بینایەکی سەرگیراو لە سەر قەبران یا خۆ لە مزگەوت، مردووی تێدا دەشۆن و غوسڵی دەدەن.

**غسل** / qosl ، ـها/: [عربی] اسم. غوسڵ؛ کاری خۆ شتن بە ئاو بە ڕێوڕەسمێکی تایبەتی بۆ پاکی و نزیکی بە خوداوە.

◘ **غسل ارتماسی**: **غوسڵ** بە شێوەی قوم بوون لە

ئاودا.

**غسل ترتیبی:** غوسڵ بە شێوەی شۆردنی سەر و مل، پاشان نیوەی ڕاست و دواخر نیوەی چەپی لەش.

**غسل تعمید:** شۆردنی لەش بە ئاو پێدا کردن یان پرشانی ئاوی پیرۆز بە ڕێوڕەسمێکی تایبەت بۆ وەرگرتنی دین بە تایبەت دینی مەسیح.

▣ **غسل دادن:** غوسڵ کردن/ دان؛ شۆردن ‹تا او را غسل بدهند بقیه ترتیب قبرش را دادەاند: هەتا غوسڵی بکەن، ئەوانیتر قەبریان بۆ کەندووە›.

**غسل کردن:** غوسڵ کردن؛ لەشپیسی دەرکردن ‹غسل کرد و آمادەی نماز خواندن شد: غوسڵی کرد و بۆ نوێژ ساز بوو›.

**غش** / qaš/: [عربی]/اسم. ۱. کەوش؛ شۆبە؛ غەش؛ خەش؛ گوهش؛ لە هۆش چوون بە هۆی ترس، نەخۆشی یان ماندوویەتی ۲. فێ؛ فەرکەم؛ پەرکەم؛ خوو؛ خووداری؛ خوداری؛ گەشکە؛ سەرع.

▣ **غش کردن:** بوورانەوە؛ بووردنەوە؛ بوردنەوە؛ بوورینەوە؛ دڵ بوورانەوە؛ دڵ بوورین؛ کەوشین؛ بێهۆش بوون؛ لە هۆش خۆ چوون؛ دڵچوون؛ ویەردەیوە؛ دڵتەپین؛ چ وێ شیەی؛ لێویان(لە فێدا)؛ لەسەرخۆ چوونی کتوپڕی و کەمخایەن.

**غش** / qeš, qaš/: [عربی]/اسم. خەوش؛ خەش: ۱. تێکەڵاوی؛ ئاوێتەیی؛ دۆخی تێچوون و لێزیاد بوونی شتی قەلب و بێبایەخ لەگەڵ شتێکی گرانباییدا ۲. غەوش؛ دلۆ؛ خەوشداری.

▣ **غش داشتن:** بە خەوش بوون؛ خەوشدار بوون؛ خەشدار بوون.

**غشا** / qešā/: [عربی]/اسم. کاژ؛ توخ؛ توێک؛ تۆژاڵ؛ توێژاڵ؛ لوخ: ۱. ـها/ پێستی زۆر ناسک ۲. کاژی؛ ناوپەنچک؛ پەردەیەکی ناسک کە ئەندامانی ناو سک (وەک سی، دڵ، گورچیلە) دادەگرێ.

**غشائی** / qešā'î/: [عربی] ☜ **غشایی**

**غشایی** / qešāyî/: [عربی] *صفت.* کاژی؛ توخی؛ تۆژاڵی؛ توێژاڵی؛ لۆخی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە کاژەوە ‹بافت غشایی: شانەی کاژی› ۲. *[گیاەشناسی]* ناسک، ڕوون و پتر نەرم ۳. پێستئاسا؛ وەکوو پێست * **غشائی**

**غشغش** / qašqaš/: *صوت. [گفتاری]* قاقا؛ تریقەتریق؛ دەنگی بەرزی پێکەنین.

**غشگیر** / qašgîr ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کتێبگر؛ ئامێرێک بە شێوەی دوو پەڕەی پاڵ بە پاڵی یەک، لە چێو، کانزا یان پلاستیک بۆ ڕاست ڕاگرتنی ڕزنی کتێبان لە کتێبخانەدا: **فرازە؛ کتابگیر**

**غش و ریسه** / qaš-o-rîse/: [عربی/ فارسی]/*اسم. [گفتاری]* پیران؛ ئاڵە؛ دۆخ یان چۆنیەتی ناو زک بڕان و پێچ لە خۆدانی لە پەستا لە بەر پێکەنین یان گریانی زۆر.

▣ **غش و ریسه رفتن:** پیرانکردن/ بردنەوە؛ ناو سک بڕیان؛ تووشی پیران هاتن ‹داشتند از تماشای سر و وضع من غش و ریسه می‌رفتند: لە تەماشای سەر و سەکوتم خەریک بوون پیرانیان دەکرد›.

**غشی** / qašî ، ـها/: [عربی] *صفت. [گفتاری]* فێدار؛ خوودار؛ سەرعی؛ تووشیاری نەخۆشینی فێ ‹معلوم شد داماد غشی است: دەرکەوت زاواکە فێدارە›.

**غصب** / qasb/: [عربی]/*اسم.* داگیر؛ واگیر؛ ڕاسەر؛ زەوت؛ زەبت؛ قتووت؛ چوپ؛ یارەوز؛ کار و ڕەوتی دەست گرتنە سەر شتێکدا بەبێ ڕەزای خاوەنەکەی.

▣ **غصب کردن:** داگیرکردن؛ لەهاندن؛ زەوت کردن؛ قەچماندن؛ ڕاسەرکردن؛ بە زۆر ساندن؛ ئەرەگێرتەی؛ دەست بە سەردا گرتن.

هەروەها: **غصب شدن**

**غصبا** / qasban/: [عربی]قید. بە زۆر؛ زۆری؛ زۆرەکی؛ داگیرکەرانە؛ زۆرکارانە ‹غصبا آنجا را مالک شد: بە زۆر بوو بە خاوەنی ئەوێ›.

**غصبی** / qasbî/: [عربی] صفت. داگیرکراو؛ ڤەگرتی؛ هیستۆک؛ ئەستێندراو؛ زەوتی ‹مال غصبی: ماڵی داگیرکراو›.

**غصه** / qosse ، ـها/: [عربی]/سم. خەم؛ غەم؛ خەفەت؛ خەمگینی؛ جخار؛ جەخار؛ جغار؛ مەینەت؛ مەینەتی؛ کەسەر؛ کوڵ؛ کوڵ؛ مۆژە؛ گژم؛ مق؛ کۆڤان؛ ئەندۆ؛ ئەنوو؛ ئەنۆ؛ پەژارە؛ خوسە؛ موروز؛ تانۆت؛ ئاڵووز؛ ئالوز؛ ئالووس؛ حەژمەت؛ کەرب؛ کوزیرک؛ پەرێشانی بە هۆی لە دەسدانی شتێک یان کەوتنە ناو بارێکی نالەبارەوە.

▣ غصه خوردن: خەفەت خواردن؛ خەم خواردن؛ تەمیان؛ خەفەت/ خەم چوونە دڵ ‹بە خاطر پسرش خیلی غصه می‌خورد: بۆ کوڕەکەی زۆری خەفەت دەخوارد›.

غصه دادن: خەفەت/ خەمکردنە دڵ؛ خەفەت (پێ)دان؛ دڵتەنگ کردن؛ خەفەتبارکردن؛ مەینەت دان ‹خیلی پدر و مادرش را غصه داد: زۆر خەمی کردە دڵی دایک و بابی›.

غصه داشتن: خەفەت هەبوون: ١. خەفەتبار بوون؛ خەمبار بوون؛ خەم لە دڵ بار بوون ‹قدر یک کوه غصه دارم: بە قەد کێوێک خەفەتبارم› ٢.خەم/ خەفەت/ پەژارە/ ئەندۆ ویستن؛ بوونە هۆی خەم و خەفەت ‹آخر این هم غصه دارد؟!: ئاخەر ئەمەیش خەمی دەوێ؟!›.

غصه‌ی کسی شدن: خەمبار/ خەفەتبار بوون؛ پەژارە داگرتن؛ پێ ناخۆش بوون ‹وقتی خبر ناخوشی‌اش را شنیدم خیلی غصه‌ام شد: کاتێ هەواڵی ناساغیەکەیم بیست زۆر خەمبار بووم›.

**غصه‌دار** / qossedār/: [عربی/ فارسی] صفت. خەمین؛ خەمێن؛ خەفەتبار؛ خەفەتدار؛ خەمبار؛ تەمبار؛ دڵتەنگ؛ پەرۆش؛ جەرگاوس ‹داستانش خیلی غصه‌دار بود: داستانەکەی زۆر خەمین بوو›.

هەروەها: **غصه‌دار بودن؛ غصه‌دار شدن؛ غصه‌دار کردن**

**غضب** / qazab ، ـها/: [عربی]/سم. تووڕەیی؛ ئاژر؛ ئەرناف؛ خەزر؛ بەهەج؛ برووت؛ جونگ؛ شیپۆر؛ هێرس؛ خەسم؛ خشم؛ خەید؛ قین؛ قینی؛ ڕق؛ ڕک؛ گژ؛ غەیز؛ وەرد؛ خەزر؛ ڕاگەشی.

▣ غضب کردن: (لێ) تووڕە بوون؛ ئاڵۆز بوون؛ قەڵس بوون؛ خەیدین؛ غەیدین؛ خەزرین؛ غەزرین؛ ڕق هەستان؛ وە ڕقەوە چوون؛ ڕک گرتن ‹دیروز رییس به ما غضب کرد: دوێنێ سەرۆک لێمان تووڕە بوو›.

**غضب‌آلود** / qazabālûd/: [عربی/ فارسی] صفت. ڕقاوی؛ قەڵسانە؛ بە ڕقەوە؛ بە ڕکەوە؛ بە قینەوە؛ بە تووڕەییەوە؛ بە تیکوڕگ؛ خەزریو؛ بەهەجۆک؛ ڕکهەستاو؛ ڕکئەستوور؛ قرمپڕ ‹صدای غضب‌آلود: دەنگی ڕقاوی›.

**غضبناک** / qazabnāk/: [عربی/ فارسی] صفت. تووڕە؛ ئاژری؛ گرگین؛ سل؛ مۆڕ؛ ڕقاوی؛ ڕقن؛ ڕقدار؛ ڕکن؛ ڕکۆ؛ ڕکدار؛ قیندار؛ قەڵس؛ بەهەجۆک؛ ڕقهەستاو؛ بەڕک؛ قەرس؛ جاڕز؛ قاڵس؛ ڕکهەستای ‹با لحنی غضبناک پرسید: بە زمانێکی تووڕەوە پرسی›.

**غضروف** / qozrûf ، ـها/: [عربی]/سم. کرۆژنە؛ کرۆژە؛ کرۆژنە؛ کرۆچەنە؛ کرۆچەنە؛ کرمەچۆلێ؛ کراکراکە؛ کراکە؛ کرۆژەڵە؛ کرکراگە؛ کرکرتۆکە؛ کرکرۆکە؛ کرکرۆچکە؛ کرکرۆکە؛ قرتێنکە؛ قرتێنە؛ قرقرتۆک؛ قرقلتۆک؛ قرقروویچک؛ خرۆچک؛ خرێنچکە؛ خرتە؛ خرمووتک؛ خرمووتە؛ خرمووچک؛ خرتنەک؛ خرتێنک؛ زەنگەلۆر؛ کەرکەریک؛ کورکورۆژە؛ کرکرە؛ کرتک؛ کرتە؛ کراگ؛ کرکرۆک؛ کروکروکە؛ هەستی‌کۆژ؛ چەشنێک شانەی پێوەندی نەرمتر لە ئێسک کە سەرچاوەی شانەی ئێسکە.

**غضروفی** / qozrûfî/: [عربی] صفت. کرکرۆکەیی؛

کڕکڕاگەیی؛ کڕکڕک؛ کرۆژنەیی؛ کرۆچەنەیی؛ خرمووچکی؛ کرکرۆچکەیی: ١. لە جنسی کرۆژنە ٢. لە بیچمی کرۆژنە.

**غفران** / qofrān/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* لێبواری؛ لێخۆشبوویی؛ لێبوردوویی؛ لێبوردەیی.

**غفلت** / qeflat, qaflat، ـها/: [عربی]/*اسم.* بێهۆشی؛ بێئاگایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خافڵان؛ سەوخان ‹غفلت موجب پشیمانی است: ئاخری بێهۆشی پەشیمانیە›.

▣ **غفلت کردن**: خافڵ بوون؛ ئاگا/ هۆش (لێ) بڕان؛ بێئاگایی‌کردن؛ بێ‌های‌کردن ‹اگر غفلت بکنم، از دستم می‌رود: ئەگەر هۆشم لێ ببڕی لە کیسم ئەچێ›.

**غفلتاً** / qeflatan, qaflatan/: [عربی]*قید.* لەپڕا؛ لەپڕ؛ لەپڕتا؛ ناکاو؛ ناکا؛ ناگا؛ ناگەهان؛ بێخەبەر؛ بێئاگا؛ کوت‌پڕ؛ کوت‌وپڕ؛ نەکاو؛ گز و گوم؛ گز و گومبەت؛ ناخلاف ‹غفلتاً پایم لیز خورد: لەپڕا قاچم هەڵخزا›.

**غفیله** / qofeyle/: [عربی] ☜ نماز غفیله، **نماز**

**غل** / qol، ـها/: [عربی]/*اسم. [قدیمی]* کۆت؛ سندم؛ پێوەند؛ پەیوەند؛ پابەند؛ پاشبەن؛ خەلیلی؛ بەندێکی ئاسنین کە لە مل و دەست و پای دیلیان دەکرد ‹این عکس، میرزا رضا کرمانی را با غل و زنجیر نشان می‌دهد: ئەم وێنە، میرزا ڕەزا کرمانی بە کۆت و زنجیرەوە پیشان دەدات›.

**غلا** / qalā/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* قاتی؛ قات و بڕی؛ قات و قڕی؛ نێز؛ سۆڤ؛ گرانی بە بۆنەی نەبوونی پیتەوا، بەتایبەت خواردەمەنیەوە.

**غلات** / qallāt/: [عربی] جمعِ ☜ **غلّه**

**غلاف** / qalāf، ـها/: [عربی]/*اسم.* قلێف؛ قلاف؛ کالان؛ کێلان؛ کاڤلان: ١. پۆشەن یان بەرگی ئامرازی تیژ (وەک شیر، خەنجەر یان چەقۆ) ٢. توێکڵ و پۆشەنی لە چەرم، پەلاستیک یان مقەبا بۆ کتێب، عەینەک و... ٣. *[گیاەشناسی]* تۆکڵ؛ توێکڵ؛ پۆشەنی بڕێ دانە وێڵە (وەک باقلە و لووبیا) ٤. *[جانورشناسی]* جێی کۆبوونەوەی چنگ و ناخونی بڕێ لە گیانەوەران (وەک پشیلە و شێر) لە سەر پەنجەیاندا.

▣ **غلاف کردن**: ١. کالان‌کردن؛ قلێف کردن ‹شمشیرت را غلاف کن!: شیرەکەت کالان‌کە!› ٢. *[کنایی]* متەق بڕان؛ دەمکوت بوون؛ قوڵف کردن؛ لە ترسان یان لە هەڕەشە و گوڕەشە، بێدەنگ بوون و پاشگەز کردن ‹تا دوستانم را دید، غلاف کرد: هەر هەواڵەکانمی دیت، متەقی برا›.

**غلافی** / qalāfi/: [عربی] *صفت.* کالانی؛ قلێفی: ١. وەکوو قلێف ٢. کالاندار؛ بە کالانەوە.

**غلام** / qolām، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم.* خولام؛ غولام؛ لێز؛ خولکە: ١. کۆیلە؛ کۆلە؛ کوێلە؛ کۆلی؛ بەندە؛ بەنی؛ بەردە ٢. *[قدیمی]* نۆکەر؛ هژمە؛ هەشمەت؛ خزمەتکار.

▣ **غلام حلقه به گوش**: *[مجازی]* نۆکەری دەستەسینە؛ ئەوەی ڕادەستی دەستوور و خزمەتی کەسێک بێ و لە خۆیەوە هیچ دەستەلاتێکی نەبێ.

**غلام خانه‌زاد**: خانەزا؛ خانەزاد؛ خانەزاو؛ خانەزای؛ کوێلە و خولامێ کە ماڵە ئاغادا هاتۆتە دنیاوە و گەورە بووە.

**غلامانه** / qolāmāne/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* شاگردانە؛ هبوودی؛ ئاوەلانە؛ چێشتانە؛ دەستخۆشانە؛ دەسخوەشانە؛ پارەیەک بۆ بەردەست یان شاگردی دووکان.

**غلام‌بچه** / qolāmbačče، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی]/*اسم. [قدیمی]* لێز؛ بەردەست؛ وەردەس؛ کوڕیژگە یان تازەلاوێ کە لە ماڵێکدا خزمەتکاری دەکرد و بە تایبەت چاوەدێری لە منداڵانی بە ئەستۆ بوو.

**غلام‌گردش** / qolāmgardeš، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم. [قدیمی]* بەرهێوان؛ خولام گەردەش؛ بەهێوانی؛ بانێژە؛ بانجێڵە؛ ئەنوا؛ بێرایی؛

هەیوانێک لە پێشەوەی ماڵ کە دەلاقەی ژوورەکانی پێ بخوا و بڕوانێتە سەر حەوش و دەر و باندا.

**غلامی** / qolāmî/: [عربی]/اسم. خولامی؛ خولامەتی: ١. کۆیلەیی؛ کۆیلەتی؛ کۆلەیی ‹یوسف را در مصر به غلامی فروختند: یووسفیان بە کویلەیی لە میسردا فرۆت› ٢. نۆکەری؛ خزمەتکاری؛ بار یان چۆنیەتی خولام بوون.

▣ **غلامی کسی را کردن**: نۆکەری کەسێک کردن؛ خولامی کەسێک کردن ‹اگر این کار درست بشود غلامی‌تان را می‌کنم: ئەگەر ئەم کارە ڕێکی بێت، نۆکەریتان دەکەم›.

**غلبکن** / qalbkan ، ـها /: [؟]/اسم. [قدیمی] دەرمەجێل؛ دەروەنجەلە؛ پەنجەرەی کون‌ـکون لە دار کە ئەودیوی لێ دیارە.

**غلبه** / qalabe/: [عربی]/اسم. سەرکەوتوویی؛ زاڵی؛ زاڵیەتی؛ چیری.

▣ **غلبه داشتن**: زاڵ بوون؛ هەڤیاز بوون؛ چیر/ چێر بوون ‹رنگ قرمز غلبه داشت: ڕەنگی سوور زاڵ بوو›.

**غلبه کردن/ یافتن**: سەرکەوتن: ١. بردنەوە ‹تیم ما غلبه کرد: تیمی ئێمە بردیەوە› ٢. زۆر گرتن/ سەندن؛ زاڵ بوون؛ چێرکردن ‹آب غلبه کرد و وارد خانه شد: ئاو زۆری گرت و هاتە نێو ماڵەوە›.

**غلت** / qalt/: اسم. تل؛ گل؛ خل؛ خەول؛ خلار؛ خلۆر؛ خولۆر؛ گندر؛ گلۆر؛ گلۆل؛ گرۆر؛ باگلۆر؛ بانگلۆر؛ خولوپ؛ گەوز؛ گەڤز؛ بانگرۆز؛ بانگلۆز؛ بالۆر؛ ئوتۆز؛ خلێر؛ تلۆر؛ تلێر؛ گوریل؛ گریل؛ گلێر؛ گەوزە؛ گل‌پل؛ لاتراسکە؛ لاترووسکە؛ لاتریسکە: **غلط**

▣ **غلت خوردن**: گەوزان؛ گەڤزان؛ خلۆر بوونەوە؛ تل بوونەوە؛ خل بوونەوە؛ گل بوونەوە؛ گلار بوونەوە؛ گلۆل بوونەوە؛ گلێر بوونەوە؛ گلۆر بوونەوە؛ تلەو بوون؛ جاڵە بوون؛ تلانەوە؛ تلیانەوە؛ گرێل بین؛ خلێرەو بوون؛ گورێل بین؛ گل خواردن؛ تلتای؛ تلەوە بیەی؛ تلاوتلێ کەردەی؛ تل/ تلێ واردەی.

**غلتان** / qaltān/: صفت. خلار؛ خل؛ خلۆر؛ خولۆر؛ دۆڵ؛ تلۆر؛ گلۆر؛ گلێر؛ گولۆر؛ بە خول؛ بە گل و خول؛ خل‌خۆر؛ گل‌خۆر؛ وتووز؛ ئوتوز؛ ئوتوس؛ تلار؛ گلارەوەبوو ‹دانەی غلتان: دەنکی خلار›: **غلطان**

**غلتاندن** / qaltāndan/: مصدر. متعدی. //**غلتاندی**: تلاندتەوە؛ **می غلتانی**: دەتلێنیەوە؛ **بغلتان**: بتلێنەوە// تلاندنەوە؛ تلاننەوە؛ تلاندن؛ تلانن؛ هەڵپلانن؛ بزاوتن؛ پلاندن؛ پلانن؛ پلانن؛ پلاننەوە؛ پلکانن؛ گلاندن؛ تل کردن؛ گرێل کرن؛ جاڵەکردن؛ گلارکردنەوە؛ خلۆرکردنەوە؛ وتووز کردنەوە؛ گێران؛ گەوزاندن؛ گەڤزاندن؛ گلماندن؛ گلگەوزاندن؛ خولوپاندن؛ خولوپانن؛ خەولاندن؛ گندراندن؛ ڤەزلاندن؛ وەرتاندن؛ غەڵتانن؛ تلنەی؛ تلنای؛ ئەوەتلنەی؛ تلنایوە؛ ڤرڤراندن؛ جوولاندن و ڕێخستنی شتێکی خڕ یان گرۆڤەر لە سەر ڕووپەڕێک: **غلطاندن**. هەروەها: **غلتاندنی**

■ صفت فاعلی: **غلتاننده** (تلێنەرەوە)/ صفت مفعولی: **غلتانده** (تلێنراوە)/ مصدر منفی: **نغلتاندن** (نەتلاندنەوە)

**غلتک** / qaltak ، ـها/: اسم. قەنەک؛ گرێل: ١. کەرەسەیەک بریتی لە یەک یان چەن گرۆڤەر کە بە تلانەوە بە سەر ڕووبەرێکدا تەختی دەکا یان دەیپەستێوێ: **نورد-١** ٢. کەرەسە یان ئامێرێکی وا بۆ جوولاندنەوەی شتێک * **غلطک**

**غلتکی** / qaltakî/: صفت. قەنەکی: ١. بە بیچمی قەنەک ٢. بە قەنەکەوە؛ قەنەکدار * **غلطکی**

**غلت و واغلت** / qalt-o-vāqalt/: اسم. [گفتاری] تلاوتل؛ تلاوتلێ؛ گل‌وخول؛ گلورگل؛ خلەخل؛ گلان و خولان؛ تل بەم لا و بەو لادا: **غلط و واغلط**. هەروەها: **غلت و واغلت زدن**

**غلتیدن** / qaltîdan/: مصدر. لازم. // **غلتیدی**:

تلای؛ **می‌غلتی**: ده‌تلی؛ **بغلت**: بتله// تلان؛ تلانه‌وه؛ تلینه‌وه؛ تلیانه‌وه؛ گلاره‌وه بوون؛ خلۆر بوونه‌وه؛ خل بوونه‌وه؛ گل بوونه‌وه؛ گلار بوون؛ گلار بوونه‌وه؛ گلێر بوونه‌وه؛ گرۆز بوونه‌وه؛ خلۆپان؛ خولۆپیان؛ خولۆپیانه‌وه؛ گه‌وزین؛ گه‌ڤزین؛ خه‌ولان؛ گندرایش؛ گلان؛ گلیان؛ پلکیان؛ پلکان؛ پلان؛ وه‌گیرایش؛ وره‌تان؛ جاله بوون؛ گه‌فزان؛ گه‌ڤزدان؛ گه‌وزان؛ گه‌ڤلین؛ گه‌رسین؛ گلمانه‌وه؛ گل‌پل خواردن؛ گلگه‌وزاین؛ گیزین؛ په‌رخین؛ غه‌لتیان؛ تلیه‌ی؛ تلیای؛ ئه‌وه‌تلیه‌ی؛ تلیایوه؛ تلتای؛ گلانه‌وه؛ خلیانه‌وه: ١. سوور خواردنه‌وه‌ی شتێکی خڕ یان گرۆڤه‌ر له سه‌ر رووبه‌رێک ٢. جوولان به‌و شێوه‌یه * **غلطیدن**. هه‌روه‌ها: **غلتیدنی**

■ صفت فاعلی: **غلتنده** (ـ)/صفت مفعولی: **غلتیده** (تلاو)/ مصدر منفی: **نغلتیدن** (نه‌تلان)

**غلج** / qalc/: *اسم. [قدیمی]* گرێشک؛ گرفنج؛ گرفنچ؛ گریچک؛ گرێ‌کوتک؛ گرێ‌کۆره؛ گرێ‌پووچکه؛ لکه‌کۆرێ.

**غلط**[1] / qalat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* هه‌له؛ په‌له؛ فاست؛ سه‌هو؛ غه‌له‌ت: ١. کار یان ئاکاری ناته‌با له‌گه‌ڵ قانوون، شێواز یان پێوانه‌ی جێ‌بڕوای گشتیدا ‹فکر من غلط بود: بیرم هه‌له بوو› ٢. /اغلاط/ به‌رهه‌می کاری وا ‹دیکته‌اش غلط داشت: ئیملاکه‌ی هه‌ڵه‌ی هه‌بوو›.

▣ **غلط کردن**: بێجا کردن؛ گوو خواردن؛ غه‌ڵه‌ت/ قه‌ڵه‌ت‌کردن (چه‌شنێ جنێو) ‹غلط می‌کند پشت سر تو حرف می‌زند: بێجا ئه‌کا له پشته‌سه‌رته‌وه قسه بکا›.

**غلط**[2]: *صفت.* هه‌له؛ غه‌له‌ت و په‌له‌ت؛ ناته‌با له‌گه‌ڵ قانوون و شێوازی جێ‌بڕوای گشتیدا ‹کار غلط؛ فکر غلط: کاری هه‌له؛ بیری هه‌له›.

**غلط** / qalt/ ☜ **غلت**

**غلطان** / qaltān/ ☜ **غلتان**

**غلط‌انداز** / qalatandāz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دوورکوژ؛ چاوخله‌تێن؛ به ڕواڵه‌تێکی ڕازاوه و جوان به‌ڵام درۆیی ‹قیافه‌اش خیلی غلط‌انداز بود: سه‌ر و سه‌کوتی زۆر دوورکوژ بوو›.

**غلطاندن** / qaltāndan/ ☜ **غلتاندن**

**غلط‌غلوط** / qalatqulût, -qolût/: [عربی/از عربی] *صفت. [گفتاری]* هه‌ڵه‌وپه‌ڵه؛ به هه‌ڵه‌ی زۆره‌وه ‹یک صفحه غلط‌غلوط آورده که چاپش کنم!: لاپه‌ڕه‌یه‌کی هه‌ڵه‌وپه‌ڵه‌ی هێناوه له چاپی بده‌م!›.

**غلطک** / qaltak/ ☜ **غلتک**

**غلطکی** / qaltakî/ ☜ **غلتکی**

**غلط‌گیری** / qalatgîrî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* هه‌ڵه‌گری؛ هه‌ڵه‌گیری: ١. کار و ڕه‌وتی ده‌سنیشان‌کردنی هه‌ڵه‌ی نووسراوه‌یه‌ک و ڕاست‌کردنه‌وه‌یان ‹غلط‌گیری مقالات را شروع کرده‌ام: هه‌ڵه‌گری نووسراوه‌که‌تم ده‌ست‌پێکردووه› ٢. کاری ڕاست‌کردنه‌وه‌ی هه‌ڵه‌گه‌لی نووسراوه‌یه‌کی پیت‌چنراو یان تایپ‌کراو ‹این چند صفحه را هم غلط‌گیری بکن، بفرست چاپخانه: ئه‌م چه‌ن لاپه‌ڕه‌ش هه‌ڵه‌گری که، بینێره بۆ چاپخانه›.

**غلطنامه** / qalatnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* هه‌ڵه‌نامه؛ غه‌ڵه‌ت‌نامه؛ نووسراوه‌یێ که به ڕیز هه‌ڵه‌کانی کتێب یان به‌رهه‌مێکی تێدا ڕاست کراوه‌ته‌وه.

**غلط‌وواغلط** / qalt-o-vāqalt/ ☜ **غلت‌وواغلت**

**غلطیدن** / qaltîdan/ ☜ **غلتیدن**

**غلظت** / qelzat/: [عربی]/*اسم.* تیری؛ خه‌ستی؛ خه‌سی؛ هه‌سی؛ چڕی؛ نایه؛ په‌یتی: ١. دۆخ یان چۆنیه‌تی خه‌ست و تیر بوون ٢. ڕێژه‌ی بارستایی شتی تواوه به ماکی توێنه‌ره‌وه (وه‌ک خوێ و ئاو).

**غلظت‌سنج** / qelzatsanc ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* خه‌ستی‌پێو؛ ئامرازی پێوانی خه‌ستی و تایبه‌تمه‌ندیه‌کانی دیکه‌ی تراو.

**غلظت یابی** / qelzatyābî/: [عربی/ فارسی] ☜ **عیارسنجی-٢**

**غلغلک** / qelqelak/ ☜ **قلقلک**

**غلغلکی** / qelqelakî/ ☜ **قلقلکی**

**غل ـ غل** / qolqol/ ☜ **قل ـ قل**

**غلغله** / qolqole/:/اسم/. ۱. چرەبەندان؛ گۆرمۆرە؛ گورمۆرە؛ گوردەم؛ غولغولە؛ قەرەباڵغ؛ دەنگ و هەرای زۆر و بێسەرەوبەرە ‹خیابانها غلغلەای بود، که نگو!: شەقامەکان چرەبەندانێک بوو، مەپرسە!› ۲. زڵە؛ زەڵە؛ زڵهە؛ هەرا ـ هەرا؛ زەنا ـ زەنا؛ هەرا و هوریا؛ دەنگەدەنگ؛ دەنگ و هەرایەک کە زۆرتر لەگەڵ پێکەنین، ئاواز یان وتوویێژی دۆستانەدا هاورێیە ‹توی سالن غلغله بود و صدا تا سر کوچه می‌رفت: لە نێو سالۆندا زڵەیەک بوو دەنگ تا سەر کۆلانەکە دەچوو›. هەروەها: **غلغله بودن؛ غلغله شدن؛ غلغله کردن**

**غلفتی**[1] / qeleftî/: [عربی] صفت. ۱. کاڵانی؛ تویکڵئاسا ۲. ڕەشۆکی؛ قەڵبینە؛ زڕ؛ زرە ※ **قلفتی**

**غلفتی**[2]:/[گفتاری] قید. بە تەواوی؛ بێ کەم و کووڕی ‹پوستش را غلفتی کند: پێستەکەی بە تەواوی داکەند›.

▣ **غلفتی حرف زدن**:/[مجازی]/ هەڵبەستن؛ درۆ کردن؛ درۆگوتن؛ درۆ وتن.

**غلفتی زدن**:/[مجازی]/ ساختەکردن؛ گزدان؛ گزیکردن؛ لاباندن؛ فریودان.

**غلفتی کردن**:/[مجازی]/ تەتەپەخێکردن؛ سەرشکێنکردن؛ هەروا و بە درۆ سەر و بنی کارێک هێنانە یەک.

**غلفتی کندن**: گروون؛ گوروون؛ گورانن؛ گروان؛ کەوڵکردن/ کەندن؛ ساخ، بە تەواوی و یەکپارچە هەڵکەندن و پێست لێکردنەوە.

**غلو** / qolov ، ـها/: [عربی]/اسم/. زێدەڕۆیی؛ لە ناساندنی شت یان گوزارشی ڕووداوێک، بەتایبەت لە پەسنیدا لە ڕادە دەرکردن.

▣ **غلو کردن**: زێدەڕۆییکردن؛ لە تام دەرکردن ‹در مورد هواردادان آن شخص غلو کرده بود: لەمەڕ هەوگرانی ئەو کەسەوە زیدەڕۆیی کردبوو›.

هەروەها: **غلو شدن**

**غل و غش** / qal-o-qaš, -qeš/: [عربی]/اسم/. شێلەوبێلە؛ شێل و بێلە؛ گزە؛ گزی و فزی؛ درۆ و دەلەسە؛ فاک و فیک؛ فەن و فێڵ ‹غل و غش در کار ما نیست: لەکاری ئێمەدا شێلەوبێلەیەک نیە›.

**غله** / qalle ، ـها؛ غلات/: [عربی]/اسم/. دەغڵ؛ دەخڵ؛ دەغل؛ دان؛ خەلە؛ غەلە؛ خەلیە؛ هەب؛ داناش؛ دانەوێر؛ دانهێرک؛ دخلەدان؛ ناوی گشتی بۆ دەنک و دانی گیاگەلی تیرەی گەنم (وەک گەنم، جۆ، برنج، هەرزن و گەنمەشامی).

**غلیان** / qalayān/: [عربی]/اسم. [ادبی]/ کوڵ؛ کوڵە؛ کەف و کوڵ؛ قرژ؛ قرژەقرژ؛ کوڵەکوڵ؛ قوڵپە؛ قوڵپە ـ قوڵپ؛ قوڵتە؛ قوڵتەقوڵت ‹غلیان آب؛ غلیان احساسات: کوڵی ئاو؛ کوڵەی هەست›.

▣ **غلیان کردن**:/[مجازی]/ هاتنە کوڵ؛ وەکوڵ هاتن؛ هەڵقوڵان؛ جۆشیان؛ جۆشان؛ کوڵان؛ کوڵیان؛ کەلان؛ کەلین؛ ئامایوە قوڵێ ‹باز احساساتش غلیان کرد: دیسان هەستی هاتە کوڵ›.

**غلیان** / qalyān/: [؟] ☜ **قلیان**

**غلیظ** / qalîz/: [عربی] صفت. خەست و خۆڵ؛ هەس و هۆڵ؛ کەسکون؛ کسکون: ۱. خەست؛ خەس؛ هەس؛ خەستاو؛ تیر؛ گران؛ کولکن؛ کەڕ ‹دوغ غلیظ: دۆی خەست› ۲. /[مجازی]/ توند و پێداگر ‹فحش غلیظ: دژوێنی کەسکوون›.

**غلیواج** / qalîvāc/ ☜ **زَغَن**

**غلیواژ** / qalîvāj/ ☜ **زَغَن**

**غم** / qam ، ـها/: [عربی]/اسم/. خەم؛ غەم؛ خەفەت؛ کەسەر؛ مەینەت؛ قار؛ مەراق؛ هەزن؛ داخ؛ جخار؛ جەخار؛ جغار؛ هەژمەت؛ سوو؛ ئالوز؛ ئالووس؛ ئەنوو؛ داغ؛ پەژارە؛ وەژارە؛ پەرۆشی؛ کەدەر؛ شاییش؛ ڕاخ؛ کول؛ کوڵ؛ موروز؛ دڵتەنگی.

▣ **غم خوردن**: خەم خواردن؛ خەفەت خواردن ‹غم نخور، درست می‌شود: خەم مەخۆ، چا دەبێ›.

**غم کسی را خوردن**: خەمی کەسێک خواردن؛

خەفەت بۆ کەسێک خواردن؛ بۆ کەسێک بە پەژارە بوون: ١. بە بۆنەی کەسێکەوە خەمین بوون ٢. لە بیری کەم کردنەوەی باری ڕەنج و ئازاری کەسێکدا بوون ‹غم کسی را بخور که غم تو را بخورد: خەمی کەسێک بخۆ بۆت بە خەفەت بێ›.

**غم‌آلود** / qamālûd/: [عربی/ فارسی] *صفت*. خەمبارانە؛ خەماوی؛ جخراوی؛ هاوڕێ لەگەڵ خەم و کەسەردا ‹داستان غم‌آلود: چیرۆکی خەمبارانە›.

**غماز** / qammāz ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت. [ادبی]* دووزمان؛ دووزوان؛ شۆفار؛ شووڤار؛ تێچن؛ چول؛ چولەئاشوو؛ قسەهەڵچن؛ قسەهێن؛ قسەبەر؛ پێکولچێن؛ خەفیە؛ زوان‌گیر.

**غم‌افزا** / qamafzā/: [عربی/ فارسی] *صفت*. دڵگیر؛ خەمێن؛ خەمهێنەر؛ تەمهێنەر ‹محیط غم‌افزا: شوێنی دڵگیر›.

**غم‌انگیز** / qamangîz/: [عربی/ فارسی] *صفت*. خەمبزوێن؛ خەمهەوێن؛ هۆی خەم و کەسەر ‹آهنگ غم‌انگیز: بەستەی خەمبزوێن›.

**غمباد** / qambād/: [عربی/ فارسی]*/اسم*. خەمبا؛ خانەبا؛ خانەما؛ گواتر؛ نەخۆشینی گەورە بوونەوەی لۆی تیرۆئید.

**غمبرک** / qambarak/ ☜ **قنبرک**

**غم پرور** / qamparvar/: [عربی/ فارسی] *صفت*. خەمبار؛ خەمپەروەر؛ دایمەخەمین.

**غمخانه** / qamxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی]*/اسم*. خەمخانە؛ خەفەتخانە؛ جێگایەک کە هۆی خەم و پەژارە بێ.

**غمخوار** / qamxār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت*. دڵسۆز؛ خەمخۆر؛ خەمەوەر؛ خەمخوار؛ هەڤسۆژ؛ هەڤدەنگ؛ دەردەهەر؛ جگەرسۆز: ١. چاوسوور؛ خەمان؛ مامەخەمە؛ خالەخەمە؛ هاوبەش لە خەمی دیتراندا ‹دوست غمخوار: دۆستی دلسۆز› ٢. دەربەند؛ لە ئەندێشەی ئاسایش و باشتر بوونی ژیانی کەس یان کەسانی‌تردا ‹همیشه غمخوار مادرش بود: هەمیشە خەمخۆری دایکی بوو›. هەروەها: **غمخواری**

**غمخورک** / qamxorak ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم. [گفتاری]* شاهۆ؛ شینەشاهۆ؛ شینەشاوە؛ شاوەشینە؛ شاوەبەلەک؛ شاوەشینکە؛ شاوە؛ شاڤاشین؛ شاڤەشین؛ شاڤ؛ شاڤە؛ واق؛ بۆتیمار؛ چرک؛ خەمخۆرە؛ خەمەخۆرە؛ باڵدارێکی گەورەی مل و قول درێژە، لە قەراخ ئاوان دەژی، لە تاریکانی بەیانی و ئێواران دەخوێنی و دەنگی وەکوو هەنیسکەی گریانە.

**غمدیده** / qamdîde ، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *صفت*. خەمین؛ خەمبار؛ بە کوڵ؛ تووشیاری کوڵ‌وکەسەر ‹دل غمدیده: دڵی خەمین›.

**غمز** / qamz ، ـها/: [عربی]*/اسم. [ادبی، قدیمی]* ١. چاوداگری؛ کاری ڤەهلدان؛ قەرپاندن؛ ئاماژە بە بزواندنی چاو و برۆ ٢. دووزمانی؛ دووزوانی؛ شووڤاری؛ قسەهەڵچنی؛ قسەهێنی؛ قسەبەری؛ شۆفاری.

**غمزدا** / qamzodā, qamzedā /: [عربی/ فارسی] *صفت*. خەمڕەوێن؛ خەملابەر؛ خەفەتبەر؛ لە نێوبەری خەم و پەژارە ‹موسیقی شاد و غمزدا: مووسیقای شاد و خەمرەوین›.

**غمزده** / qamzade ، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *صفت*. خەمین؛ خەمگین؛ خەمبار؛ خەفەتبار؛ ماتەمین؛ جخراوی ‹قیافەی غمزده: ڕواڵەتی خەمین›.

**غمزه** / qamze ، ـها/: [عربی]*/اسم*. هەنگ: ١. خەمزە؛ چاوبرکێ؛ چاوبرکە؛ چاوبازی؛ چاوبرکانێ؛ کزونیز؛ چەش‌شەنە؛ چەش‌وەنە؛ بزاوی چاو و برۆ و ئەندامانی لەشی ژن، بۆ سەرنج ڕاکێشانی جینسی پیاو ٢. ناز؛ ناز و گۆز؛ شاخ و بەلەک؛ ئینجە و فینجە.

**غمکده** / qamkade ، ـها/: [عربی/ فارسی]*/اسم. [ادبی]* خەمخانە؛ خەفەتخانە؛ خەمگە؛ مالی خەم؛

جێگای خەم و خەفەت.

**غمگسار** / qamgosār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. خەمخۆر؛ خەمان؛ خەمەوەر؛ هاودەم؛ هامدەم؛ هەڤدەنگ. هەروەها: **غمگساری**

**غمگین** / qamgîn/: [عربی/ فارسی] صفت. خەفەتبار؛ خەمین؛ خەمگین؛ خەمبار؛ پەژار؛ ناشاد؛ مرۆز؛ مرۆچ؛ قژژۆک؛ مەجووجە؛ خدۆک؛ کولۆڤان: ۱. لێوبەبار؛ سەرکز؛ زوێر؛ زویر؛ زوور؛ زوویر؛ دڵبریندار؛ زیر؛ دهۆ؛ دڵبکول؛ مات؛ مەینەتبار؛ خەمخوار؛ کۆلیل؛ دڵ بەخەم ‹مرد غمگین: پیاوی خەفەتبار› ۲. خەمناک؛ کولدار؛ ئاخدار؛ دڵ پەشێوکەر ‹داستان غمگین: چیرۆکی خەمین›.

**غمگینی** / qamgînî/: [عربی/ فارسی]/اسم. ماتی؛ پەژاری؛ خەمباری؛ خەمینی؛ خەمناکی؛ خەفەتباری؛ دۆخ یان چۆنیەتی خەمین بوون.

**غمناک** / qamnāk/: [عربی/ فارسی] صفت. مات؛ خەمناک؛ خەمین؛ خەمگین؛ بە کوڵ؛ خەمبار؛ دەستەوئەژنۆ؛ دەستەئەژنۆ؛ دەست بە ئەژنۆ ‹صدای غمگین: دەنگی مات›.

**غمنامه** / qamnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. خەمنامە؛ سۆزنامە: ۱. نووسراوەیەک کە خەم و پەژارەی تێدا نووسراوە ۲. تراژێدیا.

**غمین** / qamîn/: [عربی/ فارسی] صفت. *[ادبی]* خەمین؛ خەمگین؛ خەمبار؛ پەژار؛ خەمناک؛ دڵ بە خەم.

**غنا** / qanā/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* دارایی؛ دەوڵەمەندی؛ دەوڵەمەنی.

**غنا** / qenā/: [عربی]/اسم. *[فقه]* ۱. ئاوازی خۆش ۲. ساز و ئاواز.

**غنائم** / qanā'em/: [عربی] ☜ **غنایم**

**غنائی** / qanā'î/: [عربی] ☜ **غنایی**

**غنائم** / qanāyem/: [عربی] جمعِ ☜ **غَنیمَت: غنائم**

**غنایی** / qenāyî/: [عربی] صفت. *[ادبی]* ۱. ئەویندارانە؛ سەر بە ئەوین ۲. ئاوازی؛ شیاو و لەبار بۆ ئاواز ‹شعر غنایی: شیعری ئاوازی› * **غنائی**

**غنج** / qanc/: اسم. ۱. [عربی] خەمزە و ناز ۲. [عربی] پل؛ پێچ و تاو؛ پێچ و خول؛ قەمچ و پێچ؛ قەمچ و خول؛ با و خول؛ پێچ و با ۳. *[قدیمی]* جەواڵ؛ جواڵ؛ کورزە؛ کیسەی گەورە.

▣ **غنج زدنِ دل**: *[مجازی]* فنچق کردنی دڵ؛ دڵ بۆ شتێک دەرهاتن ‹دلم برای یک لیوان آب خنک غنج می‌زد: دڵم بۆ لیوانێک ئاوی سارد فنچقی کردبوو›.

**غنچه** / qonče ، ـها/: اسم. خونچە؛ غونچە؛ گۆچک؛ گۆپکە؛ کولووک؛ گولووک؛ گولیک؛ کلووک؛ بیرۆڤ؛ چم؛ جۆش؛ ولی؛ پژک؛ پێژەک؛ گولباف؛ فنچقە؛ سۆلینە؛ گوڵدەم؛ چوزە؛ گوڵی هێشتا نەپشکووتوو.

▣ **غنچه دادن/ کردن**: غونچەکردن؛ گوڵ کردنەوە؛ هەڵپشکووتنی گوڵ.

**غنچه‌دهان** / qončedahān ، ـها؛ ـان/: صفت. دەمتەنگ؛ دەمخونچە؛ خونچەدەم؛ نوقڵەدەم؛ نوقڵدەم؛ زار تەنگ؛ بە دەمێکی وەک خونچە بچووک و جوانەوە. هەروەها: **غنچه‌لب**

**غنده** / qonde/: اسم. *[قدیمی]* ۱. جاڵجاڵووکە؛ جاوتەنە؛ داوتەنە؛ پند؛ پندەپیر؛ پیرۆشکە؛ کاکڵەمووشان؛ تەبەتۆر ۲. قۆزاخە؛ کەلو؛ کەلوو؛ گاڵ؛ گوزک؛ گودە؛ گێچەڵی؛ شرش؛ کلۆی پەموو.

**غنودن** / qonûdan, qunûdan/: مصدر. لازم *[ادبی]* // **غنودی**: خەوتی؛ **می غنوی**: دەخەوی؛ ــــ// ۱. خەوتن؛ خەفتن؛ نووستن؛ وتەی؛ دەخەو راچوون (وێڕای هێمنی و ئاسایش) ۲. سرەوتن؛ سرەوین؛ حەسانەوە؛ سانەوە؛ سرەوەی؛ سیایوە؛ هێورین؛ هێوران؛ هەدرین؛ ئاسوودە بوون و سەقامگرتن ۳. *[کنایی]* خەوی یەکجاری کردن؛ مردن. هەروەها: **غنودنی**

■ صفت مفعولی: **غنوده** (خەوتوو)/ مصدر منفی: **نغنودن** (نەخەوتن)

**غنی** / qanî/: [عربی] *صفت.* ١. *اغنیا/[ادبی]* دارا؛ دەولەمەن؛ دەولەمەند ٢. تەژی؛ تژی؛ پڕ؛ پەڕ.

**غنیمت** / qanîmat ، ـها؛ غنائم/: [عربی]/*اسم.* ١. دەسکەوت؛ ئەوەی بشێ کەلکی لێ بگیردرێ ٢. تالان؛ ئەوەی کە لە شەڕدا لە دوژمن دەست دەکەوێ.

▣ **غنیمت بودن:** بە قازانج بوون؛ بە کەلک بوون.

**غنیمت دانستن/ شمردن:** بە قازانج زانین؛ بە باش زانین.

**غنیمت گرفتن:** تالانی گرتن؛ لە شەڕدا شتێک لە دوژمن وەرگرتن: **بە غنیمت گرفتن**

**بە غنیمت بردن:** بە تالان بردن؛ تالان‌کردن.

**بە غنیمت گرفتن** ☜ **غنیمت گرفتن**

**غنیمتی** / qanîmatî/: [عربی] *صفت. [گفتاری]* تالانی؛ بە تالان‌گیراو؛ گیرکەوتوو ‹سلاح غنیمتی: چەکی تالانی›.

**غواص** / qavvās ، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم.* نوقڤان؛ نقورڤان؛ بناولێدەر: ١. مەلەوانی بن‌گۆم ٢. ژێرئاوگەڕ؛ کەسێ کە کاری مەلەکردن لە ژێر ئاوە بۆ دۆزینەوەی شت ‹غواص مروارید: نوقڤانی مرواری›.

**غواصی** / qavvāsî/: [عربی]/*اسم.* نوقڤانی؛ کاری مەلەکردن لە ژێر ئاودا ‹برای بە دست آوردن مروارید غواصی می‌کردند: بۆ دۆزینەوەی مرواری نوقڤانیان دەکرد›. هەروەها: **غواصی کردن**

**غوچ** / qûč/: [ترکی] ☜ **قوچ**

**غور** / qowr, qo:r/: [عربی]/*اسم.* کنە؛ منێ؛ کار و ڕەوتی ڕامان؛ تێرامان؛ هشاندن؛ قووڵ‌بوونەوە؛ بن دەرهێنان؛ تێفکرین یان لێکۆڵینەوەی زۆر بەوردی. هەروەها: **غور کردن**

**غورباغه** / qûrbāqe/: [ترکی] ☜ **قورباغه**

**غوررسی** / qowr.rasî, qo:r-/: [عربی/ فارسی] /*اسم.* بن‌کۆڵی؛ کار و ڕەوتی بن دەرهێنان؛ هشاندن؛ کنەکردن؛ منێ کرن؛ لێکۆڵینەوە و تێرامان لە قووڵایی شتێک.

**غوره** / qûre ، ـها/: *اسم.* قۆرە؛ بەرسیلە؛ پەسیرە؛ پەرسیلە؛ پەسیلە؛ بەسیلە؛ بسیرە؛ بێسیرە؛ پێسیرە؛ ژوور؛ ژێلە؛ ژێلێ؛ هالە؛ هاڵ؛ هالێ؛ هالەژێلە؛ سڕەمۆک؛ هارسم؛ ترێی کاڵی سەوز و ترش.

▣ **غوره نشده مویز شدن:** *[کنایی]* هێشتا لە شاگردی نەخەلسان و دەم لە وەستایی کوتان ‹بچه‌های امروزی غوره نشده می‌خواهند مویز بشوند!: مندالی ئەوڕۆکە هێشتا لە شاگردی نەخەلساوە دەم لە وەستایی دەکوتن!›.

**با یک غوره سردی و با یک مویز گرمی شدن:** *[کنایی]* بە پفێک داگیرسان و بە تفێک کوژانەوە؛ بە بایەک داریانەوە؛ بە کشەمەرێ مردن؛ بە ترێ بەن بوون؛ زۆر گەزنگاز بوون.

**غوزه** / qûze ، ـها/: *اسم. [گیاه‌شناسی]* گۆزک؛ قۆزاخە؛ قولاخ؛ قۆلاخ؛ قۆزلاخ؛ خۆز؛ قۆزلاخە؛ شرش؛ بەری وشک و پشکۆتووی برێ گیا (وەک پەموو).

**غوشا(ی)** / qûša(y)/: *اسم. [قدیمی]* کەمرە؛ کەپرە؛ گەمرە؛ گەڕمە؛ سرە؛ سڕ؛ دەوەدەشتی؛ دەوەکێویلە؛ ڕیخ و شیاکەی وشکەڵاتوو.

**غوطه** / qûte/: [عربی]/*اسم.* قوم؛ نقم؛ نوقم؛ نقووم؛ قولت؛ قولتە؛ چۆنیەتی وەژێر ئاوکەوتن بەبێ نیشتن ‹در میان آب غوطه می‌خورد: لە نێو ئاودا قوم ببوو›.

▣ **غوطه خوردن:** قوم بوون؛ بناو بوون؛ قولتان؛ قولتیان؛ قولت خواردن؛ چوونە ژێر ئاو؛ بنیەکێش بوون.

**غوطه زدن:** هەلاتن؛ قولتان؛ چوونە ژێر ئاو (و دیسان دەرهاتن).

**غوطەور** / qûtevar/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ژێراڤ؛ ژێراو؛ بناو؛ قورت؛ قوم؛ نوقم؛ نەوق؛ نقوو؛ نقۆ؛

مرتک؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی قوڵت خواردنەوە ‹جسم غوطەور در یک سیال: ماکی ژێراڤی تراوێک›.

**غوغا** / qowqā, qo:qā/: [عربی]/اسم. زلە؛ هەرا؛ هەڵلا ـ هەڵلا؛ هەمهەمە؛ زەنا؛ هەرا ـ هەرا: ١. هەرا و هوریا؛ هیل‌هێلەک؛ چەقە و گورە؛ هەلمەلە؛ گیرە و نیرە؛ هەقلی‌مەقۆ؛ خوخا؛ قاڵ‌قوو؛ قواقوو؛ کار و بارێ کە دەبێتە هۆی هەڵخرانی شۆر و شەوق ٢. زەنا ـ زەنا؛ زنا ـ زنا؛ گێلەشۆ؛ گێلەشۆک؛ چرەبەندان؛ زلە؛ گورمۆرە؛ جمکوت؛ هەمهەمە و تێکەڵ ـ پێکەڵی بە هۆی زۆری جەماوەرەوە.

**غوغاسالار** / qowqāsālār, qo:qā- / ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. ئاژاوەگێڕ؛ خوازیاری ئاژاوە و کێشە و هەرا.

**غوغاسالاری** / qowqāsālārî, qo:qā- / ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئاژاوەگێڕی؛ حکوومەت و دەسەڵاتی کەسانی هەرچی و پەرچی.

**غوغاطلب** / qowqātalab, qo:qā- / ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. بشێوەخواز؛ ئاژاوەگێڕ؛ هۆگر و خووگرتووی ئاژاولە نانەوە.

**غوک** / qûk / ، ـها؛ ـان/: اسم. [ادبی] بۆق؛ بەق؛ وەق؛ قرواق؛ قورواق؛ قورباق؛ قرباق؛ قربۆق؛ قەرباقە؛ قورباقە؛ قریک؛ قرپۆک.

**غول** / qûl / ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. غوول: ١. دێو؛ ئەرژەنگ؛ درنج؛ بوونەوەرێکی خەیاڵی ٢. [مجازی] مێردەزمە؛ مێردئەزمە؛ دێوەزمە؛ پیرهەفۆک؛ پیرهەفی؛ هلێن؛ بوونەوەرێکی زل و زەبەلاح و ناحەز ٣. [مجازی] ئەوەی کە زۆر زل و بەرچاوە، بەتایبەت کەسێ کە لە هاوتاکانی خۆی سەرترە.

▣ **غول بیابانی**: [مجازی] ڕمووزن؛ هلێن؛ پیرهەفۆک؛ دێوەزمە؛ مێردەزمە؛ پژرهەفی؛ کەسی زل و ناحەز و سەر و سەکوت شێواو.

**غول بی‌شاخ و دم**: [مجازی] تەژە؛ حەپۆل؛ زەبەلاح؛ کەلان؛ مەندەبۆر؛ مەندەبوور؛ بم؛ گۆڵە؛ کەسی زلی نەپۆڕ و ناحەز ‹در باز شد و یک غول بی‌شاخ و دم وارد شد: درگا کرایەوە و تەژەیەک خۆی کرد بە ژووردا›.

**غول آسا** / qûlāsā/: [عربی/ فارسی] صفت. دێوئاسا: ١. وەکوو دێو ٢. گەورە؛ کەڵەگەت؛ بە قەوارەی گەورەوە ‹ساختمان غول‌آسا: خانووبەرەی دێوئاسا›.

**غول پیکر** / qûlpeykar/: [عربی/ فارسی] صفت. بلەرمان؛ باڵەبان؛ بە پەیکەری زۆر گەورەوە ‹ماشین غول‌پیکر: ماشێنی بلەرمان›.

**غول پیکری** / qûlpeykarî/: [عربی/ فارسی]/اسم. [پزشکی] بلەرمانی؛ باڵەبانی؛ زل بوونەوەی نائاسایی لەش بە هۆی نەخۆشی هیپۆفیز و زۆر دەردانی هورمۆنی گەشەوە.

**غولسنگ** / qûlsang / ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. تاشەبەرد؛ تەڵ‌سەنگ؛ بەردی زلی نەتاشراو کە زۆرتر بۆ بینای ڕێز نان یان خانووبەرە بە کار دەچێ.

**غیاب** / qiyāb/: [عربی]/اسم. نەبوونی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوون. بەرانبەر: **حضور** ‹در غیاب من خبری نشد؟: لە نەبوونی مندا باسێک نەبوو؟›.

**غیاباً** / qiyāban/: [عربی] قید. لە نەبوونیدا؛ لە نەبوونی کەسێکدا ‹غیاباً محاکمه شد: لە نەبوونیدا دادگایی کرا›.

**غیابی**[1] / qiyābî/: [عربی] صفت. پشتەسەر؛ پشتەمل؛ لە پشتە سەر؛ بە دۆخ یان چۆنیەتیەک کە کەسی پێویست یان خوازراو لەوێ نەبێ ‹حکم غیابی؛ دادگاه غیابی: حوکمی پشتەسەر؛ دادگای پشتەمل›.

**غیابی**[2]: قید. بە نەبوونی؛ بەبێ هەبوونی ئەو کەس یان کەسانە کە پێویستە ببن ‹فراریان غیابی محاکمه شدند: هەڵاتووان بە نەبوونی دادگایی کران›.

**غیب** / qeyb/: [عربی] صفت. ١. پیوار؛ پێوار؛ بەرپێوار؛ نادیار؛ نەدیار؛ پەنام؛ نە لەبەر چاو ‹غیب شدن: پیوار بوون› ٢. غەیب؛ خەف؛ دوور لە

دەوەری ئاگایی و زانست ‹عالم غیب: جەهانی غەیب›.

▣ **غیب دانستن:** غەیب زانین؛ لە ڕازگەلی نهێنی ئاگادار بوون.

**غیب شدن:** غەیب/ نادیار/ پێوار بوون؛ لە بەر چاو نەمان؛ پەنام بیەی؛ لە بەر چاو ون بوون ‹مثل این‌که کلید من غیب شده: وادیارە کلیلەکەم غەیب بووە›.

**غیب کردن:** پێوار/ غەیب/ نادیارکردن؛ لە بەر چاو ون‌کردن ‹کبوترها را غیب کرد: کۆترەکانی پێوار کرد›.

**غیب گفتن:** غەیب‌گوتن؛ لە نادیار ئاگایی دان؛ لە ڕازگەلی نهێنی خەبەر دان.

**از غیب خبر دان:** هەواڵی غەیب دان؛ لە شتی بەرپێوار و نادیار خەبەر دان‹می‌گویند از غیب خبر می‌دهد: ئێژن هەواڵی غەیب ئەدات›.

**غیبت** / qeybat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* غەیبەت: ۱. پاشملە؛ پاشەملە؛ لەمەت؛ گاڵەگورت؛ خوسپ؛ خراپەبێژی ئەم و ئەو لە نەبوونیاندا ‹غیبت تو را می‌کرد: پاشەملەی تۆی دەگوت› ۲. دۆخی نەبوونی کەس یان شتێک لە جێگەی دیاریکراودا.

▣ **غیبت داشتن:** ئامادە نەبوون؛ غایب بوون ‹دیروز غیبت داشتی: دوێنێ ئامادە نەبووی›.

**غیبت کردن:** ۱. پاشملە گوتن؛ لەمەت/ خوسپ کردن؛ لە دەمەودان؛ ناو بە خراو بردن ‹غیبت مدیر را می‌کردیم: پاشملەی بەڕێوبەرمان دەگوت› ۲. ئامادە نەبوون ‹از اداره غیبت کرده بود: لە مەزرینگە ئامادە نەبوو›.

**غیبگو** / qeybgû ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* خەفزان؛ غەیب‌وێژ؛ زانا بە نادیاران؛ ئەوەی لە نهێنی هەواڵ دەدا.

**غیبگویی** / qeybgûyî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* خەفزانی؛ کاری خەبەر لە نهێنی دان ‹از مردم پول می‌گرفت و برایشان غیبگویی می‌کرد: لە خەڵکی پارەی وەردەگرت و خەفزانیانی دەکرد›.

**غیبی** / qeybî/: [عربی] *صفت.* غەیبی؛ لە نادیارەوە ‹امداد غیبی: یارمەتی غەیبی›.

**غیر** [1] / qeyr/: [عربی] *صفت.* نامۆ؛ بیانی؛ بێگانە ‹تو خودی هستی وگرنه این حرف را به غیر نمی‌شود گفت: تۆ لە خۆمانی دەنا ئەم قسە بۆ نامۆ ناکرێ›.

**غیر** [2]: *قید.* جگە؛ بڵ؛ بێجگە؛ بێژگە؛ خەیر؛ بێرژە؛ غەین؛ خەین؛ خێنجی ‹غیر از این چیزی ندارم: جگە لەمە هیچم نیە›.

**غیرـ** / qeyre/: [عربی] *پیشوازه.* نا ـ ؛ بێ ـ ؛ نە ـ ؛ لا ـ ‹غیرانسانی: ناکەسانە؛ غیرعاقلانە: بێ‌عەقلانە›.

**غیرت** / qeyrat/: [عربی]/*اسم.* جامێری؛ جوامێری؛ مێرخاسی؛ کانێسە؛ کانیسە؛ غیرەت؛ کەیفەرات؛ جەربەزە؛ هەستێ کە لە کاتی پاراستن و چاوەدێری لەوەی هۆی دڵبەستەیی و خۆشەویستیە، دەبزوێ ‹مردم غیرت به خرج دادند و آزادیشان را به دست آوردند: خەڵک جوامێریان نیشان دا و ئازادی خۆیان خستە چنگ›.

▣ **غیرت کسی به جوش آمدن:** دەماری کەسێک جووڵان؛ غیرەتی کەسێک زیخان؛ ڕەگی غیرەتی کەسێ هەستان: **سرغیرت‌آمدن**

**سر غیرت آمدن** ☜ **غیرت کسی به جوش آمدن**

**غیرتمند** / qeyratmand ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* مێرخاس؛ جوامێر؛ جامێر؛ سەماخ؛ بە ناموس؛ ناموس‌پارێز؛ بە غیرەت ‹جوان غیرتمند: لاوی مێرخاس›.

**غیرتمندی** / qeyratmandî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* مێرخاسی؛ جامێری؛ جوامێری؛ دۆخ یان چۆنیەتی ناموس‌پارێز بوون ‹مردم کوه‌نشین به غیرتمندی معروفند: خەڵکی کوێستان بە مێرخاسی ناوبانگیان دەرکردووە›.

**غیرتی** / qeyratî ، ـها/: [عربی] *صفت.* [گفتاری] ناموس‌پارێز؛ ‹شوهر غیرتی: شووی ناموس‌پارێز›.

▣ **غیرتی شدن:** خوێن بەر چاو گرتن؛ چاو پەڕینە تەوقی سەر؛ بە خیرەت هاتن ‹از

شنیدن این حرف غیرتی شد و چاقویش را درآورد: هەر ئەم قسەی بیست خوێن بەرچاوی گرت و دەستی برد بۆ چەقۆ›.

**غیرعادی** / qeyre'ādî/: [عربی] صفت. نائاسایی؛ بێژۆک؛ لۆق؛ پێچەوانەی داب و نەریتی سەلماو ‹در این روستا این طرز رفتار شما غیرعادی است: لەم گوندەدا ئەم شێوە جوولانەوەی ئێوە نائاساییە›.

**غیرفلز** / qeyrefelez/: [عربی] ☜ **نافلز**

**غیرقابل اجرا** / qeyreqābele'ecrā/: [عربی] صفت. نەکردنی ‹برنامەی غیرقابل اجرا: بەرنامەی نەکردنی›.

**غیرقابل استماع** / qeyreqābele'estemā'/: [عربی] صفت. نەبیستنی؛ نەبیسراو: *(الف)* بە بار و دۆخێکەوە کە نەبیسرێت *ب)* بە بار و دۆخێ کە شیاوی گوێبۆگرتن نەبێ.

**غیرقابل اعتماد** / qeyreqābele'etemād/: [عربی] صفت. باوەڕپێنەکراو؛ بە دۆخێک کە جێ‌بڕوا نەبێ.

**غیرقابل انتظار** / qeyreqābele'entezār/: [عربی] صفت. چاوەڕواننەکراو؛ کوتوپڕی.

**غیرقابل انکار** / qeyreqābele'enkār/: [عربی] صفت. حاشاهەڵنەگر؛ وا کە نەشێ خۆی لێ لادەی.

**غیرقابل قبول** / qeyreqābeleqabûl/: [عربی] صفت. وەرنەگیراو؛ نابەجێ؛ ڕێ‌پێ نەدراو؛ ناڕەوا.

**غیرمترقبه**/qeyremotaraqqebe, -moteraqqebe/: [عربی] صفت. لەپڕ و نەکاو؛ لە ناکاو؛ کتوپڕی؛ دوور لە چاوەڕوانی ‹رویداد غیرمترقبه: ڕووداوی لەپڕ و نەکاو›: **نامترقّب؛ نامترقّبه**

**غیرمستقیم** / qeyremostaqîm/: [عربی] صفت. تیان؛ ناڕاستەوخۆ.

**غیرمنتظره** / qeyremontazere/: [عربی] صفت. چاوەڕواننەکراو؛ دوور لە چاوەڕوانی ‹خبر غیرمنتظره: هەواڵی چاوەڕواننەکراو›.

**غیرنظامی** / qeyrenezāmî ، ـها/: [عربی]/سم. شەخسی؛ مەدەنی؛ کەسێ کە لە هیچ هێزێکی چەکداریدا نیە.

**غیره** / qeyre/: [عربی] ضمیر. ئیتر؛ هیتر؛ هیتد؛ ئیدی ‹کاسه، بشقاب و غیره: بایە، دەوری و ئیتر›.

**غیژ** / qîj(j)/: صوت. گیڤه؛ کیفه؛ گف؛ گیف؛ وژە؛ هوژە؛ دەنگی بڕینی هەوا بە هۆی تێپەڕینی شتێک (وەک تیر یان مووشەک).

**غیظ** / qeyz ، ـها/: [عربی]/سم. تووڕەیی؛ قین؛ ڕک؛ ڕق؛ قینی؛ پیش ‹از فرط غیظ رنگش کبود شده بود: لە بەر تووڕەیی زۆر ڕەش و شین هەڵگەڕابوو›.

▣ **غیظ کردن**: *[گفتاری]* ڕق داگرتن؛ قین کردن؛ قین لێ‌هەڵگرتن؛ ڕق خواردنەوە؛ پیش کردن؛ غەزرین؛ بە تووڕەیی و قینەوە جوولانەوە ‹خیلی به ما غیظ کرد: زۆر ڕقی لێ داگرتین›.

**غیظ آلود** / qeyzālûd/: [عربی/ فارسی] صفت. قیناوی؛ ڕقاوی؛ خەزریو؛ بەهەجۆک؛ ڕک‌هەستاو؛ ڕک‌ئەستوور؛ قرم‌پڕ ‹صدای غیظ‌آلود: دەنگی قیناوی›.

**غین** / qeyn/: [عربی]/سم. غێ؛ غەین؛ ناوی عەرەبی بیست‌ودووهەمین پیتی ئەلف‌وبێتکەی زمانی فارسی.

**غیور** / qayûr/: [عربی] صفت. جامێر؛ جوامێر؛ بەدەمار: ۱. مێرخاس؛ مەرخوز ‹برادر غیور: برای جوامیر› ۲. دلێر؛ دلیر؛ ئازا؛ دڵ‌ستوور؛ بەجەرگ ‹سرباز غیور: سەربازی دلێر›.

**غیورانه**[1] / qayûrāne/: [عربی/ فارسی] صفت. جامێرانە؛ جوامێرانە؛ بە مێرخاسی ‹رفتار غیورانه: ئاکاری جوامێرانە›.

**غیورانه**[2]: قید. جوامێرانە؛ جامێرانە؛ بە ڕەوشت و شێوازی کەسێکی مێرخاس ‹آزاد غیورانه پایداری کرد: ئازاد جوامێرانە خۆی ڕاگرت›.

**غیه** / qîyye/: /سم. قیژە؛ زریکە؛ دەنگی زیق و زۆر بەرزی لە ناکاو بە بۆنەی کەسەر یان خۆشی زۆرەوە: **قیّە**. هەروەها: **غیه کشیدن**

# ف

**ف / f/**: *حرف.* ف؛ نیشانەی بیست‌وسێهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**ف / fe/**: *اسم.* فێ؛ ناوی بیست‌وسێهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**فا / fā/**: *اسم.* ١. ناوی عەرەبی بیست‌وسێهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی ٢. [فرانسوی] *[موسیقی]* فا؛ چوارەمین نۆتی مووسیقا.

**فائده / fā'ede/**: [عربی] ☜ **فایده**

**فائق / fā'eq/**: [عربی] ☜ **فایق**

**فائقه / fā'eqe/**: [عربی] ☜ **فایقه**

**فابریک / fābrîk/**: [فرانسوی] *اسم.* *[گفتاری]* کارخانە.

**فابریکی / fārîkî/**: [فرانسوی] *صفت.* *[گفتاری]* کارخانەیی؛ فابریکی: ١. چێ‌کراو لە کارخانەدا ٢. سەر بە کارخانە.

**فابل / fābl/**: [فرانسوی] *اسم.* ڕاز؛ نەزیرە؛ نەزیلە؛ فابڵ؛ کورتە حیکایەتی ئەخلاقی کە پتر قارەمانەکانی گژ و گیا و گیانەوەرانن.

**فاتالیست / fātālîst/**: [فرانسوی] *صفت.* فاتالیست: ١. قەدەری؛ بڕوامەند بە چارەنووس و قەزا و قەدەر ٢. کۆنەپەرست؛ کۆنەپرێس؛ خورافاتی؛ پووچەڵپەرست.

**فاتالیسم / fātālîsm/**: [فرانسوی] *اسم.* فاتالیسم؛ بڕوا بە چارەنووسێکی ئەزەلی کە ڕووداوەکانی ژیانی هەموو گیاندارانی لە پێشدا بڕیوەتەوە.

**فاتح / fāteh ، ـها؛ ـان؛ ـین/**: [عربی] *صفت.* سەرکەوتوو؛ سەرکەوتە؛ سەرکەفتگ؛ چێر.

**فاتحانه[1] / fātehāne/**: [عربی/ فارسی] *صفت.* سەرکەوتوانە؛ سەرکەوتانە ‹نبرد فاتحانه: شەڕی سەرکەوتوانە›.

**فاتحانه[2]**: *قید.* سەرکەوتوانە؛ سەرکەوتانە؛ بە سەرکەوتوویی ‹فاتحانه پیشروی می‌کردند: سەرکەوتوانە دەچوونە پێشەوە›.

**فاتحه / fātehe/**: [عربی] *اسم.* ئەلحەمد؛ فاتیحە؛ یەکەمین سوورەتی قورئان کە لە پرسەدا بۆ ڕۆحی مردووی دەخوێنن.

⊡ **فاتحه‌ی چیزی را خواندن**: *[کنایی]* خەیر شتێ بەشەو کردن/ بەشینەوە/ بەخشینەوە؛ فاتێحای شتێ خوێندن؛ لانی شتێ بەتاقەوە نان؛ هەواڵی ڕۆشتن و نەمانی شتێک دان ‹رفت دنبال کاسبی و فاتحه‌ی درسش را خواند: چووە شوێن کسم و کاردا و خەیری خوێندنی بەخشیەوە›.

**برای کسی/ چیزی فاتحه نخواندن**: *[کنایی]* کەسێ/ شتێ بە هیچ زانین؛ پووشی شتێ/ کەسێ فڕە دان؛ بە کەسێ/ شتێ هیچ بایەخێک نەدان.

**فاتحه‌خوانی / fātehexānî/**: [عربی/ فارسی] *اسم.*

پرسە؛ پەرسە؛ فاتحەخوێنی؛ سەرەخۆشی؛ کار، ڕەوت یان ڕێورەسمی فاتحە خوێندن بۆ مردوو و سەرەخۆشی کردن لە خاوەن مردوو.

**فاجر** / fācer/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ۱. بەدکار؛ بەوکار؛ بەدکردار ۲. داوێن‌تەڕ؛ داوێن‌پیس؛ سۆت؛ خراپکار؛ زیناکار؛ فلیتە.

**فاجعە** / fāce'e ، ـها؛ فجایع/: [عربی] *اسم.* کارەسات؛ کارەڕەهات؛ کار و ڕەهات؛ گرگاشە؛ چۆرتم؛ کەت؛ تەمەرە؛ قەترەمە؛ ڕووشە؛ فەتارەت؛ تاوێر؛ کۆلاو؛ هێلان؛ هەوتوویش؛ ڕووداوی زۆر ناخۆش و دڵتەزێن.

**فاجعەآفرینی** / fāce'e'āfarînî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کارەسات‌سازی؛ کار یان ڕەوتی کارەسات نانەوە؛ چۆرتم خۆش کردن؛ کارەسات ساز کردن. هەروەها: **فاجعەآفرین**

**فاجعەآمیز** / fāce'e'āmîz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* کارەساتی؛ تێکەڵ بە کارەسات؛ هاوڕێ لەگەڵ چۆرتمدا.

**فاحش** / fāheš/: [عربی] *صفت.* ۱. زەق؛ دیار؛ گت؛ زۆپ ‹خطای فاحش: هەڵەی زەق› ۲. *[نامتداول]* دزێو؛ نەچێ؛ سک؛ ناحەز؛ نالەبار.

**فاحشگی** / fāhešegî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* بەستۆکی؛ گاندەری: ۱. ڕووسپیەتی؛ جندەیی؛ چۆنیەتی خۆفرۆش بوون ۲. ڕووسپیگەری؛ جندەگەری؛ کار و پیشەی خۆفرۆش.

**فاحشە** / fāheše ، ـها؛ فواحش/: [عربی] *اسم.* بڤکێ؛ خراپە؛ ڕووسپی؛ جوننە؛ سۆزمانی؛ سووزمانی؛ حیز؛ حیزە؛ قەحبە؛ گاندە؛ گاندەر؛ گەنەوڵ؛ فەلیت؛ فەلهیتە؛ فەلتۆیی؛ گوزلی؛ بوڵ؛ پوڵ؛ خۆفرۆش؛ ژنێ کە بۆ پووڵ خۆ دەخاتە بەر حەزی پیاوان.

**فاحشەخانە** / fāhešexāne ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* جوننەخانە؛ قەحبەخانە؛ کەرخانە؛ ماڵێ کە ژن و پیاوی داوێن‌پیسی لێ جووت دەبن.

**فاختە** / fāxte ، ـها/: [عربی] *اسم.* فاتنگ؛ تفیرک؛ تڤیلک؛ تفتیلک؛ کەفوکووک؛ کۆترەباریکە؛ ترێنە؛ ترێنکە؛ ترنیسق؛ توویل؛ کووکوو؛ کەپوو؛ گاپێڵ؛ گاپڵ؛ کۆترەگایە؛ مەلێکی دەنگ خۆش لە تیرەی کۆتران، بچووکتر و بۆرتر لە کۆتر، بە پشتی شینی مەیلەو کەوە و دووچکی کورتەوە کە لە تلیشی تاشە شاخ و کونەبەرد و قلیلەداراندا دەژی.

**فاخر** / fāxer/: [عربی] *صفت.* بەشکۆ؛ شکۆدار؛ هەیدەدان؛ مایەی شانازی.

**فارس** / fārs ، ـها/: *اسم.* فارس؛ کەسێ کە زمانی زگماکی فارسیە.

**فارسی**[1] / fārsî/: *اسم.* فارسی: ۱. لە دەستە زمانگەلی ئێرانی کە زاراوەکانی لە ئێران، تاجیکستان، ئەفغانستان و پاکستان باوە ۲. زمانێ کە ئەوڕۆ بەشێکی گەورە لە خەڵکی ئێران قسەی پێ دەکەن ۳. خەڵکی پارێزگای فارس.

▣ **فارسی امروز:** فارسی ئەمڕۆ/ هاوچەرخ؛ زمانێ کە فارسی زمانانی ئەم سەردەمە قسەی پێ دەکەن.

**فارسی باستان:** زمانی فارسی سەردەمی هەخامەنشیان.

**فارسی دری:** فارسی دەری: ۱. زمانی فارسی لە سەدەکانی سێ تا شەشی کۆچیدا ۲. زمانی فارسی باو لە ئەفغانستان: **دری**

**فارسی میانە:** فارسی ناوین؛ زمانی فارسی سەردەمی ساسانی.

**فارسی**[2]: *صفت.* فارسی: ۱. سەر بە فارس ۲. شەفتوور؛ قیچەڵقاچ.

**فارسی‌بری** / fārsîborî/: *اسم. [نجاری]* شەفتووربڕی؛ بڕشتی شەفتوور.

**فارسی‌زبان** / fārsîzabān ، ـها؛ ـان/: *صفت.* فارسی‌زمان؛ فارسی‌زوان.

**فارغ** / fāreq/: [عربی] *صفت.* ڕزگار؛ بەدەر؛ بێ‌گرفت؛ تەنا؛ ئازاد و ڕزگار لە بار و دۆخێکی

دژوار و ناخۆش.

▣ **فارغ بودن:** خاترجەم بوون؛ ئازاد بوون؛ ئاسوودە بوون؛ گیرۆدەیی نەبوون؛ بێخەم بوون؛ ڕزگار بوون؛ ڕەها بیەی.

**فارغ شدن:** ڕزگار بوون: ۱. خەلستن؛ خەلسان؛ خاترجەم بوون؛ ئاسوودە بوون؛ خەفەت لە لا نەمان؛ خەم لێ ڕەوین ‹از بدهکاری فارغ شدن: لە قەرزداری خەلستن› ۲. زایین؛ زارۆ هێنان؛ مناڵ بوون؛ نجات بیەی ‹دیشب سارا فارغ شد: دوێشەو سارا زایی›.

**فارغ‌التحصیل** / fāreqottahsîl ، ـها؛ ـان/: [از عربی]/اسم. دەرچوو؛ ئەوی خولێکی دەرسی دیاریکراوی تەواو کردووە ‹فارغ‌التحصیل دانشکدەی مهندسی: دەرچووی زانکۆی ئەندازیاری›.

**فارغ التحصیلی** / fāreqottahsîlî/: [از عربی]/اسم. بار و دۆخ یان چۆناوچۆنی تەواو بوونی دەرس.

**فارغ بال** / fāreqbāl/: [از عربی] صفت. *[مجازی، ادبی]* خاترجەم؛ دڵنیا؛ بێخەم.

**فارماکوپە** / fārmākope ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. *[پزشکی]* فارماکوپە؛ کتێب و نووسراوەی سەبارەت بە دەوا ودەرمان.

**فارماکولژی** / fārmākolojî/: [فرانسوی]/اسم. *[پزشکی]* دەواناسی؛ دەرمان‌ناسی؛ فارماکولۆژی.

**فارنهایت** / fārenhāyt/: [آلمانی] ☜ درجەی فارنهایت، **درجه**

**فاروئی** / fāro'î/ ☜ **فارویی**

**فاروس** / fārûs/: [انگلیسی]/اسم. فانووسی دەریایی.

**فارویی** / fāroyî ، ـها/:/اسم. فارۆیی: ۱. هەر یەکە لە خەڵکی دوورگەکانی فارۆ لە دانمارک کە بە ڕەگەز ژێرمەنن ۲. زمانی خەڵکی فارۆ، لە زمانگەلی ژێرمەن: **فاروئی**

**فاز** / fāz/: [فرانسوی]/اسم. فاز: ۱. بار و دۆخێکی تایبەتی لە خولێکی گۆڕانکاریدا ۲. بەشێکی دیاریکراو لە ڕەوتانەیێک ۳. بەشێکی هاوجۆر لە دەزگایەکی چەن‌جۆردا ٤. قۆناخێک لە بزاوێکی بازنەییدا ٥. بەش؛ بەشێکی دیاریکراو لە زنجیرە چالاکیەکی خانووبەرەسازیدا.

**فازسنج** / fāzsanc ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. فازپێو؛ فازمیتر؛ جۆرێ پێچ‌کوشتی بە لامپێکی بچووکەوە بۆ دەرخستنی گەڕانی کارەبا.

**فازمتر** / fāzmetr ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. فازمیتر؛ فازپێو.

**فازنما** / fāznemā ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. فازپێو.

**فاژه** / fāje ، ـها/:/اسم. *[قدیمی]* ☜ **خمیازه**

**فاستونی** / fāstonî ، ـها/: [روسی]/اسم. فاسۆن؛ فاسۆنی؛ فاستۆنی؛ فاسۆنیا؛ فارسۆنی؛ جۆخ؛ چۆخ؛ پارچەی لە هەودای درێژ و ناسکی خوری داهێنراو بە ڕووبەرێکی لووس و بێ‌پرزەوە کە نەخشی تەیزاوەکانی لێ دیارە.

**فاسد** / fāsed/: [عربی] صفت. ۱. گەنیو؛ کتکی؛ زنخ؛ بۆگنخ؛ خەلێخە؛ خمخمۆتە؛ گەند ‹میوەی فاسد: میوەی گەنیو› ۲. *[پزشکی]* گەندەڵ؛ گەندەژ؛ گەناژۆ؛ تووشیاری نەخۆشیەکی چڵکی ۳. ـها؛ ـان/ گەندەڵ؛ فاسد؛ فەتکار؛ فەتکەر؛ گەندکار؛ بە ڕەوشت و ئاکاری دزێو و دژ بە کۆمەڵ. هەروەها: **فاسد بودن؛ فاسد شدن؛ فاسد کردن**

**فاسق**[1] / fāseq ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. سۆتە؛ داوشکەستی؛ فاسق؛ زیناکار؛ پیاوێ کە پێوەندی ناڕەوای لەگەڵ ژنی پیاوێ‌تر دامەزراندووە.

▣ **فاسق گرفتن:** پیاوێ ـجگە شوو ـ بۆ سەرجێیی خۆ ڕێدان.

**فاسق**[2]: صفت. داوێن‌تەڕ؛ داوێن‌پیس؛ فاسق؛ هۆگری چێژ و حەزی حەرام.

**فاش**[1] / fāš/: [عربی] صفت. ئاشکرا؛ لە بەرچاو؛ دیار؛ خویا؛ شتیار؛ خوانە؛ خوانی؛ هاینە؛ ڕوهند.

▣ **فاش شدن:** ئاشکرا/ هاینە/ خویا/ بەردەز

بـوون؛ دیـاری‌دان؛ ڕوو بوونـه‌وه‌؛ ڤێڤـرین؛ ده‌رکه‌وتنی نهێنی.

فـاش کـردن: ئاشـکرا کـردن؛ ده‌رخسـتن؛ ڤه‌وڕاندن؛ قچاندن؛ ڤیڤڕاندن؛ قه‌یچه‌ڕاندن.

**فاش**[٢]: *قید*. ئاشکرا؛ به ئاشـکرایی؛ بـه ڕوونی؛ بـه باڕه‌باڕ؛ به ڕاشکاوی ‹فاش مـی‌گـویم و از گفتـه‌ی خود دلشـادم: ئاشـکرا ده‌یڵـێم وخۆشحاڵـم لـه‌وه‌ی باسی ده‌که‌م›.

**فاشـــرا / fāšerā ، ـهـا/:** *اسم*. ده‌رمانـــه‌مار؛ سێوامارانی؛ ترێ‌مارانه؛ میوه‌مارانه؛ ڕێخه‌بـه‌رازه؛ ته‌ماته‌مارانه؛ گوله‌پته‌و؛ گیایه‌کی ئاڵـفی قیـت و هه‌ڵچووه بـه ڕیشـه‌ی ئه‌سـتووری هه‌میشـه‌یی، گه‌ڵای زبر و گوڵی سه‌وزه‌وه: **الاملیک**

**فاشیست / fāšîst ، ـها/:** [فرانسـوی] *اسم. [سیاست]* فاشیســـت: ١. هـــۆگر و لایـــه‌نگری ئـــامۆژه‌ی فاشیسم ٢. فاشیستی.

**فاشیستی / fāšîstî/:** [فرانسـوی] *صفت. [سیاست]* فاشیستی؛ فاشیست؛ پێوه‌ندیدار به فاشیسـمه‌وه ‹نظام فاشیستی: ڕژیمی فاشیستی›.

**فاشیسم / fāšîsm/:** [فرانسـوی] *اسم. [سیاسـت]* ڤاشیزم؛ ئامۆژه، ڕاپه‌ڕین یان ڕژیمێکـی سیاسـی لایـه‌نگری ڕه‌گه‌زپه‌رسـتی یـان گه‌لپه‌رسـتی، زۆره‌ملی و توند و تیژی له ئاست نه‌یارانه‌وه.

**فاصـله / fāsele ، ـهـا؛ فواصـل/:** [عربـی] *اسم*. ١. مـــه‌ودا؛ بـــه‌ین؛ مابـــه‌ین؛ نێـــوان؛ دورینـــگ؛ دۆمـــه‌ی؛ دۆژ؛ ناڤـــبه‌ر؛ به‌نـــدک؛ وه‌رهـــه‌نگ؛ هه‌ی‌مـه‌ی؛ کـڕ؛ فاسڵـه؛ ئه‌نـدازه‌ی دووری دوو شت یان دوو جێگا له یه‌کتر ‹فاصـله‌ی ارومیـه تـا مهاباد: مه‌ودای ورمێ تا مه‌هاباد› ٢. بـه‌ین؛ نێـوان؛ کـــه‌لێنی دوو شـــت ‹دنـدانهایش فاصــله داشـت: ددانه‌کانی به‌ینـی بـوو› ٣. *[موسـیقی]* مـه‌ودا؛ دۆژ؛ به‌نـدک؛ دورینـگ؛ لێـک‌دووری زایه‌ڵـه‌ی دوو ده‌نـــگ ٤. *[مجـــازی]* دووری؛ مـــه‌ودا؛ بـــه‌ین؛ دوورینگ؛ نێوان؛ دۆمه‌ی؛ لێـک‌بـڕانی دڵان ‹آن مـاجرا میـان مـا فاصـله انـداخت: ئـه‌و ڕووداوه دووری خسته نێوانمانه‌وه›.

◙ **فاصـله‌ی زمـانی:** مـه‌ودا؛ مـاوه ‹میـان رفـت و برگشـت او فاصـله‌ی زیـادی نبـود: نێـوان هـاتن و چوونی ماوه‌یه‌کی زۆر نه‌بوو›.

◙ **فاصـله انـداختن:** بـه‌ین (تـێ)خسـتن؛ ژه‌ڤ/ ژهـه‌ڤ کـرن؛ بـه‌ین وسـه‌ی؛ بـه‌ین دانـان ‹میانشان فاصله انداخت: به‌ینی خسته نێوانیان›.

**فاصله داشتن:** دوور بوون؛ دوویر بوون ‹ایـن دو شهر ٣٠٠ کیلومتر از هم فاصله دارند: ئه‌م دوو شـاره ٣٠٠ کیلۆمیتر لێک دوورن›.

**فاصله گذاشتن:** به‌ین خستن؛ به‌ین دانان؛ نـاو کردن؛ جیایی خستن؛ نێوان هێڵانه‌وه؛ بـه‌ین هێشتنه‌وه؛ به‌ین ئاسه‌ی ‹کمی فاصله بگذار بعـد کلمه‌ی بعـدی را بنـویس: نـه‌ختێ بـه‌ین بخـه جـا وشه‌ی تر بنووسه›.

**فاصله گرفتن:** دوور بوونه‌وه؛ دوورکه‌وتنه‌وه ‹از بخاری فاصله بگیر، لباسـت مـی‌سـوزد: لـه سـۆبه‌که دوور به‌وه، جله‌کانت ده‌سووتێ›.

**فاصله بندی / fāselebandî/:** [عربی/ فارسی] *اسم*. بـــه‌ین‌به‌نـــدی؛ کـــار و ڕه‌وتی بـــه‌ین دانـــان؛ ده‌سنیشـان کـردنی بـه‌ینی نێـوان ئه‌نـدامانی تاقمێک یان هێمانـه‌ی کۆمه‌ڵـه‌یه‌ک لـه ئاسـت یه‌کدا ‹فاصله‌بندی سطرها: به‌ین‌به‌ندی دێڕه‌کان›.

**فاصله‌سنج / fāselesanc ، ـهـا/:** [عربـی/ فارسـی] *اسم*. مه‌ودا‌پێو؛ که‌ره‌سـته‌یێ بـۆ پێـوانی دووری شت له بینه‌ر: **تله‌متر**

**فاصله‌گـذاری / fāselegozārî/:** [عربـی/ فارسـی] *اسم*. کار و ڕه‌وتی مه‌ودا هێشتنه‌وه؛ به‌ین دانـان؛ به‌ین ئاسه‌ی؛ دانانی مه‌ودا له نێوان ئه‌نـدامانی تاقمێ یان به‌شگه‌لی کۆمه‌ڵه‌یه‌کدا ‹بـین سـطرها فاصله بگذارید: له نێوان دێڕه‌کاندا مه‌ودا بهێڵنه‌وه›.

**فاضل / fāzel ، ـها، ـان؛ فُضَلا/:** [عربی] *صفت. [ادبی]* زانا؛ زانایۆخ؛ هۆزان؛ زانای ئاگـادار ‹اسـتاد فاضـل: مامۆستای زانا›.

**فاضـلاب / fāzelāb ، ـهـا/:** [عربـی/ فارسـی] *اسم*.

١. پیساو؛ وازاو؛ گەناو؛ نەقم؛ ئاوی تێکەڵ بە پیسایی ٢. ئەیاغ؛ ڕەهەند؛ ڕەهەن؛ ئاوەڕۆ؛ ئاوڕەو؛ ئاوەڕوێ؛ ئاڤرێژگە؛ ژێراوی ئاوی پیس.

**فاعل** / fā'el ـ ـها/: [عربی]/سم. ١. ـان؛ ـین/ *[نامتداول]* کەسێ کە کارێک دەکا ٢. *[دستور]* کرگار؛ کرکار؛ کرۆک؛ بکەرد؛ کەس یان شتێ کە کارێک دەکا یان کردارێکی وەپاڵ دەنرێ.

**فاعلاتن** / fā'elāton/: [عربی]/سم. *[ادبی]* فاعیلاتون؛ بناغەیەکی کێشی شیعری عەرووزی.

**فاعلن** / fā'elon/: [عربی]/سم. *[ادبی]* فاعیلون؛ لە کۆڵەکەکانی کێشی شیعری عەرووزی.

**فاعلی** / fā' elî/: [عربی] صفت. *[دستور]* کرگاری؛ سەر بە کرگار ‹صفت فاعلی: ئاوەڵناوی کرگاری›.

**فاق** / fāq ، ـها/: [از عربی/ ؟]/سم. فاق: ١. شەق؛ قەڵش؛ قەڵشت؛ شکەف؛ ترەکە؛ مێچک؛ درز و تلیشی سەر یان بنی شتێک ٢. درێژی شواڵ لە نافەکەوە تا ناوقەد.

**فاقد** / fāqed ، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. بێوەری؛ بێوەر؛ بێبەش؛ بێبارە ‹فاقد روشنایی: بێوەری لە ڕۆناهی›. هەروەها: **فاقد بودن؛ فاقد شدن**

**فاقه** / fāqe/: [عربی]/سم. *[ادبی]* دەسکورتی؛ هەژاری؛ نەداری.

**فاکت** / fākt ، ـها/: [انگلیسی از لاتینی]/سم. *[نامتداول]* ڕاستەقینە؛ ڕاستەقانی؛ فاکت؛ ڕاستیەکی بەرچاو کە ئاماژەی پێ بکرێ.

**فاکتور** / fāktor ، ـها/: [فرانسوی]/سم. فاکتۆر: ١. پسوولە؛ سیاهە؛ بەرگەی کڕین؛ هێمان؛ بەڵگەی تێدا نووسینی نرخ و چەندێتی فرۆشراوە و ناو و نیشانی فرۆشیار ٢. هۆکار؛ هەر یەکە لەو هۆیانە کە لە کار یان دیاردەیەکدا دەوریان هەیە ‹فاکتور اقتصادی: هۆکاری ئابووری›.

▣ **فاکتور گرفتن:** فاکتۆرگرتن: ١. دەرهێنانی پسوولە. هەروەها: **فاکتور دادن؛ فاکتور نوشتن** ٢. *[مجازی]* کورتکردنەوە؛ پوختەکردن ‹بحث‌های دیگر را فاکتور بگیر: قسەکانی تر کورت بکەوە›.

**فاکس** / fāks/: [انگلیسی]/سم. فەکس؛ فاکس؛ دوورنڤیس: **فکس**

**فاکس‌مدم** / fāksmodem/: [انگلیسی]/سم. فەکس‌مودێم؛ دەزگایەک بریتی لە فەکس و مودێم کە زانیاری لە کەمپیوتەرەوە دەگۆزێتەوە سەر فەکس یان لە فەکسیەوە وەردەگرێ: **فکس‌مودم**

**فاکسیمایل** / fāksîmāyl/: [از انگلیسی]/سم. فاکسیمایل؛ پۆستی وێنەیی.

**فاگوسیت** / fāgosît ، ـها/: [فرانسوی]/سم. *[زیست‌شناسی]* بێگانەخۆر؛ نامۆخۆر؛ خانووکەیەک کە دەوری ماکی بیانی دەدا و دەیخوا (وەک گولوبوولی سپی خوێن).

**فاگوسیتوز** / fāgosîtoz/: [فرانسوی]/سم. *[زیست‌شناسی]* بێگانەخۆری؛ نامۆخۆری؛ کار و ڕەوتی دەورەدان و خواردن ماکی بیانی.

**فال** / fāl ، ـها/:/سم. ١. [از عربی] فاڵ؛ مروا؛ ڕۆدا؛ داخورت؛ داخوورت؛ بەخت خوێندنەوە؛ کارێک بۆ پێش‌بینی داهاتوو ٢. مارکە؛ ڕاوکە؛ ڕامە؛ مارە؛ ڕاوە؛ مووتاوا؛ مووتاوە؛ فاڵ؛ ئەو هێلکە دەبن مریشکی هێلکەکەری دەنێن بەشکوو هێلکەکەی لە پاڵیدا بکا ٣. *[گفتاری]* لاس؛ نیودەست؛ یەکەی بژاردن و دابەش کردنی برێ شت (وەک گوێز) بەرامبەر بە پێنج دانە.

▣ **فال پرنده:** فالی بە پەلەوەر؛ فالی چاپکراو کە پەلەوەری دەسەمۆ دەیداتە دەستی مشتەریەوە.

**فال قهوه:** فالی قاوە؛ دوابینی داهاتووی کەسێک لە ڕووی ئەو نەخشانە لە لمتی قاوەی خوراوە، لە پیاڵەدا بەدی دێ.

**فال نخود:** فالی نۆک؛ دوابینی داهاتووی کەسێک بە چنینی نۆک و جێ‌گۆڕانیان.

**فال ورق:** فالی وەرەق/ پەڕە؛ دوابینی داهاتووی کەسێک بە چنینی پەڕەی کایە بە

شێوەیەکی تایبەتی و جێگۆڕکێیان.
**هم فال و هم تماشا:** *[مجازی]* هەم دیداری دۆست، هەم شکاری پۆست؛ هەم زیارەت، هەم تیجارەت؛ کار و سەیران پێکەوە.
▣ **فال دیدن:** بەخت خوێندنەوە؛ فاڵ گرتنەوە.
**فال زدن:** دوابینیکردن.
**فال گرفتن:** فاڵگرتنەوە؛ داخورت/ داخوورت گرتنەوە؛ ڕەمڵ ئاویژتن؛ فاڵ ڤەگرتن؛ بۆ زانینی ئاکامی کار یان ڕووداوێک فاڵ لێدان ‹با دیوان حافظ فال گرفتیم، خوب آمد: بە دیوانی حافز فالمان گرتەوە، باش هات›.
**به فال نیک گرفتن:** بە چاکە دانان؛ بە خاس زانین ‹آمدن او را به فال نیک گرفتم و امیدوار شدم: هاتنیم بە چاکە دانا و هیوام هاتەوە بەر›.
**فالانژ** / fālānj ، ـها /: [فرانسوی]/اسم. *[سیاست]* فالانژ؛ لات و چەقۆکێشی نێو ڕێکخراوەیەکی فاشیستی.
**فالانژیست** / fālānjîst ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. *[سیاست]* فالانژیست: ١. هەر یەکە لە لایەنگرانی پارتە فاشیستەکان، بەتایبەت لە ئیتالیا، سپانیا و لوبنان ٢. فالانژ.
**فال‌بین** / fālbîn ، ـها؛ ـان/: [از عربی/ فارسی]/اسم. گیرزان؛ فالگرەوە؛ فالگەر؛ فالگر؛ فالگیر؛ فالاوێژ؛ فالبێژ؛ قەپالگر؛ فالچی؛ ڕەمڵگرەوە؛ فیە؛ تالحبین؛ خێرە؛ خیفزان؛ خیڤزان؛ خیپک؛ ئەوەی گوایە بە فاڵ داهاتوو دەبینێتەوە: **فالگیر**
**فال‌بینی** / fālbînî/: [از عربی/ فارسی]/اسم. فالگەری؛ گیرزانی؛ کار و ڕەوتی لێکدانەوەی داهاتوو بە فاڵ: **فالگیری**
**فالگوش**/ fālgûš/: [از عربی/ فارسی]/اسم. شەمالێ؛ شەمالە؛ شەمۆلە؛ شەوشەمەکێ؛ کەڵە؛ کوڵە؛ گوێتەقێ؛ کاری دوابینی و لێکدانەوەی داهاتوو بە گوێگرتن لە قسەی ئەم و ئەو.
▣ **فالگوش ایستادن:** کەڵەکردن؛ کوڵەگرتن/ ڕاوەستان؛ کوڵگرتن: ١. خۆ مات دان بۆ گوێگرتن لە قسەی خەڵکی بۆ دوابینیکردن ٢. *[کنایی]* بە دزیەوە گوێدان بۆ شۆفاری و دووزمانی.
**فالگیر** / fālgîr/: [از عربی/ فارسی] ☜ **فال‌بین**
**فالگیری**/ fālgîrî/: [از عربی/ فارسی] ☜ **فال‌بینی**
**فالنامه** / fālnāme ، ـها/: [از عربی/ فارسی]/اسم. فاڵنامە: ١. پەڕتووکێ لە بابەتگەلی جۆراوجۆر لەمەڕ داهاتوو کە خەڵک بە خوێندنەوەی پەڕەیەکی، گوایە داهاتوو دەبیننەوە ٢. پەڕەی چاپکراوێ کە ئەو شتانەی تێدا نووسراوە.
**فالوده** / fālûde/ ☜ **پالوده**[1]
**فام** / fām ، ـها/:/اسم. ئاماڵ؛ بەش؛ واش؛ بام؛ باو؛ شێوە؛ یەکێ لە سێ هێمانی پێکهێنەری ڕەنگ (ئەو دووی‌تر بریتین لە تۆخی و تیشکدەری).
**فام‌نمایی** / fāmnemāyî/:/اسم. جیاوازی نێوان ڕەنگی هاوتیشک لە تەلەڤیزیۆنی ڕەنگیدا: **رنگتابی**
**فامیل** / fāmîl ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ١. بنەماڵە؛ خێزان؛ خاوخێزان ‹همەی فامیل آمده بودند: هەموو بنەماڵە هاتبوون› ٢. خزم؛ فامیل؛ خوێش؛ لێزم؛ خنام؛ کەس‌وکار؛ قەوم ‹آنجا فامیل داریم: لەوێ خزممان هەیە›.
**فامیلی** / fāmîlî/: [فرانسوی] *صفت.* خزمایەتی؛ قەومایەتی؛ فامیلی؛ خزمی؛ قەومی ‹زن و شوهر نسبت فامیلی دارند: ژن و شووەکە خزمایەتیان هەیە›.
**فانتزی**[1] / fāntezî/: [فرانسوی]/اسم. فانتێزی: ١. نەزیلەیەکی کورتی هەڵبژێردراو لە لایەنێکی پێکەنینی و ناعەقڵانی ژیان لە بارودۆخێکی خەیاڵیدا ٢. بەرهەمی هونەری لە خەیاڵاتی ئازادانە و بە دوور لە شێواز و ڕێبازگەلی ناسراو.
**فانتزی**[2]: *صفت.* تازەباو؛ نۆباوە؛ فانتێزی ‹رنگ‌های فانتزی: ڕەنگگەلی تازەباو›.
**فانسقه** / fānosqe ، ـها/: [روسی]/اسم. ڕەخت؛

فانسـقه؛ فانسـقیٚ؛ فانۆسـقیٚ؛ پشـتێنەیەکی چەرمی یان برێزنتی بۆ هەڵواسینی فیشەکدان، سەرەنێزە، قومقومە و چەکی کەمەری: **فانوسقه**

**فانوس** / fānûs ، ـها/: [یونانی]/اسم. فەنەر؛ فەنەرک؛ فەند؛ فانۆس؛ لەنتەر؛ لەنتەری؛ کلچان؛ فانۆز؛ فانووس؛ چرادەستی؛ چرایەکی پتر نەوتی، سەرپۆشدار و دەستی، بۆ ڕووناکی دان لە دەر و دەشتدا.

▣ **فانوس دریایی:** فانۆسی دەریایی؛ چرایەکی ڕووناکی سەر بورج، بۆ ڕێنوێنی گەمیە و پاپۆڕان لە دەریادا.

**فانوس شیطان:** ئاوری زەلکاو؛ ترووکەترووکی شەوانەی سەر زەلکاوان.

**فانوسقه** / fānûsqe/: [روسی] ☜ **فانسقه**

**فانوسه** / fānûse/: [یونانی/ فارسی]/اسم. فانووسە؛ هەر کەرەستەییٚ کە بیچمی لە فانۆس بکا (وەک دەمنەی ئاسنگەری).

**فانوسی** / fānûsî/: [یونانی] صفت. دەمنەیی؛ فانووسی؛ بە دیوارەی دەرەکی چین ــ چین و لۆ ـ لۆوە بۆ کرانەوە و چوونە ناو یەک.

**فانی** / fānî/: [عربی] صفت. فانی: ١. بیٚبنیا؛ نەپایدار؛ بیٚدرێژە؛ بیٚدەوام؛ لە ڕێی نەمانـدا ‹دنیای فانی: دنیای بیٚبنیا› ٢. مرا؛ بمر؛ نەمێن؛ نەمەن ‹آدم فانی: مرۆی مرا›.

▣ **فانی بودن:** بیٚبنیا بوون؛ فانی بوون؛ نەپایدار بوون؛ بیٚدەوام بوون. هەروەها: **فانی شدن**

**فاووس** / fāvûs/: اسم. [پزشکی] کەچەڵی؛ نەخۆشیەکی کارگی لە سەر پێستی سەرە کە مووخۆرکە و کەچەڵی لە دوودایە.

**فاویسم** / fāvîsm/: [فرانسوی]/اسم. [پزشکی] فاویسم؛ کەمخوێنی تیژی هێمولیزی کە لە خواردنی باقلەی تازە یان هەڵمژینی تۆزەکەی، یان لە بریٚ کەسدا بە هۆی نەخۆشی ژینیتیکی یان کەمایەتی ئانزیمەوە سەرهەڵدەدا.

**فایبرگلاس** / fāyberg(e)lās/: [انگلیسی]/اسم. فایبرگلاس؛ ریشاڵەی شیشەیی ناسک کە لە چێکردنی بەرهەمگەلی پیشەییدا (وەک پەشمشیشە، دەزگ، پارچە و...) بە کەڵک دێت.

**فایده** / fāy(e)de ، ـها؛ فواید/: [عربی]/اسم. سوود؛ کەڵک؛ بەهرە؛ سۆ؛ کەراو؛ فایدە؛ فێدە؛ بێر؛ هاقل: ١. قازانج؛ بەستە؛ بەسە ‹در این معامله چقدر فایده بردی؟: لەم مامەڵەیەدا چەندت سوود کرد؟› ٢. مفا ‹اگر نشنوی فایدەی گوش چیست؟: ئەگەر نەبیسی گویٚ بە کەڵکی چی دیٚ؟› ❋ **فائده**

▣ **فایده داشتن:** بە قازانج بوون؛ بە کەڵک بوون؛ بەهرە دان. هەروەها: **فایده کردن**

**فایق** / fāyeq/: [عربی] صفت. سەرکەوتوو؛ زاڵ؛ چیر؛ چێرە: **فائق**

▣ **فایق آمدن/ شدن:** سەرکەوتن؛ زایٚ بوون؛ چیر بوون.

**فایقه** / fāyeqe/: [عربی] صفت. باشتر؛ چاکتر؛ هەڤیاز: **فائقه**

**فایل** / fāyl ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. فایل: ١. پووشە؛ دۆسیە؛ پەروەندە ٢. [کامپیوتر] کۆمەڵێک زانیاری سەر بە یەک کە بە یەک ناو تۆمارکراون ٣. [مخفف] کابینێت.

**فایل کابینت** / fāylkābînet ، ـها/: [انگلیسی/ فرانسوی]/اسم. فایل کابینێت؛ کومێد یان کابینێتی جیٚ پووشە.

**فئودال** / fe'odāl ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. بەگ: ١. دەرەبەگ؛ خاوەن زەوی و زاری زۆر و زەبەند کە لە ڕەنجی وەرزێرانی سەر ئەو زەوینانە دەخوا ٢. ئاغا؛ خان.

**فئودالی** / fe'odālî/: [فرانسوی] صفت. دەرەبەگی؛ دەرەبەگایەتی.

**فئودالیسم** / fe'odālîsm/: [فرانسوی]/اسم. دەرەبەگایەتی؛ فئودالیسم: ١. دووزەنەی ئاغا و ڕەعیەتی؛ شێوازێکی ئابووری کۆن کە زەوی و زار لە بەردەست ئاغادایە و ڕەنجبەران بە سەریەوە کار دەکەن و هەر وەک زەویەکە

سەودایان پێدەکرێ ٢. *[قدیمی]* شێوازێکی ڕامیاری لە ئورووپای پێش ڕوونیسانسدا.

**فبها** / fabehā/: [عربی] حرف. چباشتر؛ چخاستر؛ چچاکتر؛ چخاستەر؛ چعالتەر ‹اگر خریدی فبها، نخریدی من می‌خرم: ئەگەر ساندت چباشتر، نەشت ساند من دەیکڕم›.

**فتادن** / fotādan/: مصدر. *[مخفف، ادبی]* کەوتن؛ کەفتن؛ کەتن؛ کەوتەی؛ کەوتش.

**فتان** / fattān/: [عربی] صفت. *[ادبی]* ئاژاوەچی؛ بشێونە؛ خمشێوێن؛ سەرسۆدەرە؛ گێرەشێوێن.

**فتاوی** / fatāvî/: [عربی] جمعِ ☜ **فتوا**

**فتح** / fath ، ـها؛ فتوح؛ فتوحات (!)/: [عربی]/اسم. ١. *[نامتداول]* کار و ڕەوتی کردنەوە؛ بازکردن؛ ئەوەکەردەی ٢. پیرۆزی؛ سەرکەوتن.

▣ **فتح باب:** ١. کردنەوەی درگا ‹فتح باب گفتگو: کردنەوەی درگای قسە› ٢. *[کنایی]* دەسپێکردن.

▣ **فتح شدن:** ١. داگیر بوون؛ داگیرکران؛ گیریان؛ فرستقین ٢. ڕزگار بوون؛ ئازاد بوون؛ کرانەوە؛ ئەوە کریەی.

**فتح خیبر کردن:** *[تعریض]* پشتی فیل شکاندن؛ سەری شا هێنان؛ بانە نیانە بان بەڕۆژەو؛ کارێکی یەکجار گەورە و دژوارکردن؛ کۆ/ کەش کەنتەی ‹با این دو تا نان خریدن انگار فتح خیبر کرده: بەم دوو نان سەندنیەوە دەڵێی پشتی فیلی شکاندووە›.

**فتح کردن:** گرتن؛ داگیرکردن؛ پێ بەرکردن؛ لەهاندن؛ فرستقاندن؛ شوێنێ بەیدەست کردن ‹مائو در سال ١٩٤٩ پکن را فتح کرد: مائۆ لە سالی ١٩٤٩دا پیکەنی گرت›.

**فتحه** / fathe/: [عربی]☜ **زبَر-١**

**فتراک** / fetrāk ، ـها/: اسم. *[ادبی]* شۆپا؛ گورژال؛ سامۆتە؛ سامۆرتە؛ سامۆتک؛ گورنیک؛ تەرکبەند؛ بەن سامۆرتە؛ بەن سامۆتە؛ بەن سامۆرتکە؛ بەندی پاشکۆ؛ ئالقە و بەندی پاشکۆی زین.

**فترت** / fatrat/: [عربی]/اسم. گت؛ مەودایەک لە ناو زەنجیرە کارێکی لە پەستا ‹فعالیت شرکت چند ماهی دچار فترت شد: کار و باری بەشدارگە چەن مانگێک تووشی گت بوو›.

**فتق** / fatq/: [عربی]/اسم. *[پزشکی]* قۆڕی؛ غۆڕی؛ کوویت؛ وەتەبا؛ فەت؛ فتق؛ فەتق: ١. خزانی نائاسایی ئەندامێک بۆ دەرەوەی شوێنی خۆی (وەک فەتقی مێشک) ٢. دەرپەڕینی ئەندامێکی ناوسک لە دیوارەی ماسوولکەیی زگەوە (وەک قۆڕی بەرگەدە).

**فتق‌بند** / fatqband ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. فەتقبەن؛ جۆرێ پۆشەن بۆ بەرگری لە داهێزان و ژانی قۆڕی.

**فتنه**[1] / fetne ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. ئاژاوە؛ بشێوە؛ بشێوی؛ پشێوی؛ ئاشۆ؛ ئاشوو؛ ئاشێو؛ گاشە؛ گەردش؛ گەردەش؛ خارۆرە؛ گۆتاوەڕۆ ‹فتنەی مغول: ئاژاوەی مەغول› ٢. هەرا؛ هەڵلا؛ زلە؛ قرە؛ زەنا ـ زەنا؛ جەنجاڵ؛ زلەزل؛ چەقەوگوڕە؛ هەقلیمەقۆ؛ ویل ‹وقتی مریم داستانش را گفت فتنەای برپا شد: کاتێ مریەم حیکایەتی خۆی گێڕاوە بوو بە هەرا› ٣. ☜ **عنبر ـ ٢**

▣ **فتنه انگیختن:** ئاژاوەگێڕان؛ گەردش نانەوە؛ هەڵلا هەڵایساندن؛ شەڕ هەڵخڕاندن.

**فتنه به پا کردن:** ئاژاوەگێڕان؛ گەردەش‌گێڕان؛ بشێوە بەرپا کردن.

**فتنه**[2]: صفت. *[گفتاری]* ئاژاوەچی؛ ئاژاوەگێڕ؛ گەردەش‌گێڕ؛ بشێونە؛ شێوەژنە؛ گێرەشێوێن؛ خومەشێونە ‹این یارو خیلی فتنه است: ئەم کابرایە زۆر ئاژاوەچیە›.

**فتنه‌انگیز** / fetne'angîz ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. قنگ بە گیچەڵ؛ شەڕبەشاران؛ ئاژاوەگێڕ؛ ئاژاوەچی؛ شەڕهەڵایسێن؛ شەڕداگرسێن؛ ئاوری بن کا؛ ئاوژێرکا؛ فتنە؛ وەیشووم؛ وەیشوومە؛ کتکە نەفتینە؛ کلکەنەفتینە؛ سەرەسۆدرە؛ چنگن؛ گولکە؛ هەڤان؛ شێوەژنە؛ هێوچی؛

ئاشـوٚکەر؛ بشـێونە؛ گێرەشـێوین؛ هلوەشـیار؛ عەوان؛ مایە فیتنە و شوڤار.

**فتنـەجـو** / fetnecû ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* کەتن گێڕ؛ هێوچی؛ تایبەتمەنـدی کەسـێ کە حەز بە قرە و ئاژاوە دەکا.

**فتنەگر** / fetnegar ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بن گلـتە؛ مایەفتنـە؛ سەرەسـوٚدرە؛ گوٚبەندگێـڕ؛ گوٚتالکەر؛ شەڕهەڵخڕێن؛ بشێونە؛ ئاشوٚکەر.

**فتو** / foto/: [فرانسوی]*اسم.* *[گفتاری]* ١. وێنـەگر؛ عەکاس ٢. وێنەگرخانە؛ عەکاس‌خانە * **فوتو**

**فتوا** / fatvā, fetvā ، ـها؛ فتاوی/: [عربی]*اسم.* فتـوا؛ دینـا: ١. ئیجـازە؛ بـڕیار یـان داوەری بـە پیـێ قـانوونی شـەرع ٢. *[مجـازی]* داوەری و بـڕیاری کەسێک لەمەڕ بابەتێکی دیاریکراوەوە * **فتوی**

**فتوالکتریـک** / foto'elektrîk/: [فرانسـوی]*اسـم.* کارەبای بەرهەم‌هاتوو لە تیشک: **نورابرق**

**فتوبیوتیـک** / fotobiyotîk/: [فرانسـوی] *صـفت.* *[زیسـت‌شناسـی]* تیشـکـژی؛ ئاتـاج و خوازیـاری تیشک بۆ ژیان و گەورە بوون.

**فتوبیــولژی** / fotobiyolojî/: [فرانســوی]*اســم.* *[زیست‌شناسی]* تیشکژی‌ناسی؛ لقێک لـە زانسـتی ژیناسی کە لە چۆناوچونی کـارتێکردنی تیشـک بە سەر گیاندارانداا دەتوێژێتەوە.

**فتوت** / fotovvat/: [عربی]*اسم.* *[ادبی]* لاوچـاکی؛ جوامێری؛ میرخاسی.

**فتوتروپیسم** / fotot(e)ropîsm/: [فرانسـوی]*اسـم.* *[زیست‌شناسی]* تیشکوازی؛ تیوازی؛ ڕەوتی هەڵدان یان بار گۆڕان بەرەو شوێنی تیشکدەر، بەتایبەت لە ڕووەکدا.

**فتوح** / futûh, fotûh/: [عربی]*اسم.* ١. جمعِ ☜ **فتح** ٢. *[نامتداول]* کراوەیـی؛ فردقـی؛ گوشـایش؛ فەرەحانی؛ فەرحانی؛ فەرعانەتی.

**فتوحـات** / futûhāt, fotûhāt/: (!)[عربـی] جمـعِ ☜ **فتح**

**فتور** / futûr, fotûr/: [عربـی]*اسم.* *[ادبی]* سسـتی؛ سیسی؛ سسـی؛ کەهالـی؛ کاهێلـی؛ خلیسـکی؛ خاوی؛ نەبەگەیی.

**فتوسفر** / fotosfer/: [فرانسـوی]*اسم.* فوتۆسـفیر؛ تیشکەگۆ؛ بەشی هەرە گەشـی خـۆر یـان هـەر گۆیەکی‌تر کە بە چاو ببینرێ.

**فتوسل** / fotosel/: [انگلیسی]*اسم.* باتری نـووری؛ پیلی تیشکی؛ جۆرێ باتری کـە تیشـکی هـەتاو دەکاتە هێزی کارەبایی.

**فتوســنتز** / fotosantez/: [فرانســوی]*اســم.* *[گیاه‌شناسی]* فوتۆسەنتیز؛ ڕەوتێ کە گیا ـ وێـرای تیشکی هەتاوـ لە کەربون و هەڵمی ئاو، هیدراتی کەربون چێ دەکا: **نورساخت**

**فتوشیمی** / fotošîmî/: [فرانسـوی]*اسم.* *[شیمی]* فوتۆشـیمی؛ لقێـک لـە زانسـتی کیمیـا کـە دەپەرژێتە سەر کار تێکردنی هێزی تیشـک لـە گۆڕانکاری کیمیاییدا.

**فت و فراوان** / fatt-o-farāvān/: *صفت.* *[گفتاری]* فـرە و فـراوان؛ زۆر و زەمەنـد؛ زۆر و زەبەنـد؛ مشەمەر.

**فتوکپی** / fotokopî/: [فرانسوی]*اسم.* فوتۆکـوپی: ١. کار یان ڕەوتی وێنە هەڵگرتن لە بەڵـگەیەک بە دەزگای تایبەت بەو کارە ٢. دەزگایێ کە بـە هۆی کاردانەوەی کیمیایی (فوتۆکوپی تـەڕ) یـان فیزیکی (فوتۆکـوپی وشـک، زیـراکس) بـە هـۆی تیشکەوە، لە بەڵگە وێنـە هەڵـدەگرێ ٣. / ـهـا/ کوپی؛ وێنەیێ کە بە دەزگای فوتۆکوپی گیرابێ.

**فتــوکرم** / fotok(o)rom/: [فرانسـوی] *صـفت.* فوتۆکرۆم؛ خاوەن ئاڵ‌وگۆڕی ڕەنگ لە بەرانبـەر تیشکەوە.

**فتــوگرافی** / fotog(e)rāfî/: [فرانســوی]*اســم.* فوتۆگرافی؛ عەکاسی؛ وێنەگری.

**فتــوگرام** / fotog(e)rām/: [فرانســوی]*اســم.* فوتۆگرام؛ وێنەیێ کە لە دانانی شـتێک لـە بـەر کاغەزی هەستۆک و لێدانی تیشک بەدی دێ.

**فتوگرامتری** / fotog(e)rāmetrî/: [فرانسوی]*اسم.*

فوتۆگرامیتری؛ زانستی پێوانی ڕێز و درشت بە یارمەتی وێنە، بەتایبەت بە وێنە هەڵگرتنی هەوایی.

**فتومتر** / fotomettr ، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. تیشک‌پێو؛ ئامرازی پێوانی ڕادەی تیشک و ڕۆشنایی.

**فتون** / foton ، ـهـا/: [انگلیسی]/اسم. فوتۆن؛ گەردیلەی بێ‌جرمی هەڵگری تیشک: **فوتون**

**فتوی** / fatvā, fetvā/: [عربی] ☜ **فتوا**

**فته** / fate ، ـها/:اسم. پتە: ١. بەڵگە؛ نووسراوە ٢. فیش؛ لەتە کاغەزی پچووکی تێدا نووسراو.

◙ **فتەی طلب**: بەڵگەی قەرزداری؛ پسوولەیەک کە قەرزدار دەیداتە خاوەن قەرز.

**فتیش** / fetîš/: [فرانسوی]/اسم. ١. تاپۆ؛ شتێ کە بە مەکۆی ڕۆحێکی بەهێز یان نیشانەی هێزێکی جادوویی دابنرێ ٢. *[روانشناسی]* شت، ئەندام یان بەشێکی لەش کە بوون یان خەیاڵی هەبوونی بۆ دامرکانی ڕەوان پێویستە.

**فتی‌شیست** / fetîšîst ، ـهـا/: [فرانسوی] *صفت.* فتی‌شیست؛ باوەڕمەند بە فتی‌شیسم.

**فتی‌شیسم** / fetîšîsm/: [فرانسوی]/اسم. فتی‌شیسم؛ بڕوا بە هەبوونی هێزی سیحراوی لە بڕێ شتدا.

**فتیله** / fetîle ، ـها/: [معرب از آرامی]/اسم. ماسول؛ پلیتە؛ فتێلە؛ فتیلە؛ فتێلک؛ ئیفت: ١. لەتە گوریس یان پارچەیەکی لۆکەیی کە بە هەڵمژینی سووتەمەنی گڕ دەگرێ و دەسووتێ ٢. گوریسێ بۆ تەقاندنەوەی تەقەمەنی لە ڕێی دوورەوە ٣. گوریسێک لە توپ و چەکە کۆنەکاندا بۆ ئاگردانی باروت ٤. بەنی بادراوی تاڵ‌پێچ ٥. *[پزشکی]* ماکێکی نەرم و خاوێن وەک لۆکە یان باند بۆ هەڵمژینی چڵک و کیمی برین.

**فتیله‌ای** / fetîle'î/: [معرب] *صفت.* فتیلەیی؛ خاوەن فتێلە ‹چراغ سه فتیله‌ای: چرای سێ فتیلەیی›.

**فجایع** / facāye'/: [عربی] جمعِ ☜ **فاجعه**

**فجر** / facr/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* بەیان؛ تاوهەڵات؛ ئەلند؛ بەرەبەیان؛ بەربەیان؛ سیسان؛ بەیانی ڕوون؛ مەلابانگدان.

**فجور** / focûr, fucûr/: [عربی]/اسم. فناز؛ فناس؛ ڕەفتاری نالەبار؛ کردەوەی دزێو و گونا.

**فجیع** / facî'/: [عربی] *صفت.* دڵتەزێن؛ زۆر ناخۆش؛ هۆی کوڵ و کەسەری زۆر ‹مرگ فجیع: مردنی دڵتەزێن›.

**فحاش** / fahhāš/: [عربی] *صفت.* دەم‌چەپەڵ؛ زمان‌پیس؛ دەم‌پیس؛ بیسکار؛ زرجان؛ جنێوفرۆش؛ دژوێن‌فرۆش؛ سخیف‌بێژ؛ دەڤچێژ؛ دژمان‌دەر؛ دژمان‌وەرش؛ جوێن‌فرۆش.

**فحاشی** / fahhāšî/: [عربی]/اسم. باوگرەوازی؛ باوکبازی؛ جوێن‌فرۆشی؛ دەڤچێژی؛ کاری جنێو دان؛ ناسزا وتن.

◙ **فحاشی کردن**: جنێو/ جوێن دان؛ ناسزا وتن؛ دژمان‌دەی/ دای؛ سەکانن؛ چیرین؛ پەلاختن؛ پەلچڤاندن.

**فحش** / fohš ، ـها/: [عربی]/اسم. جنێو؛ جوێن؛ جمین؛ جوون؛ جژوێن؛ دژوێن؛ دژمێن؛ دژوون؛ دوشمین؛ دشمان؛ دژمانی؛ دشمێن؛ دژنام؛ خەڵەت؛ سخێف؛ خوسن؛ خۆسن؛ خوەسن؛ خراو؛ بیسکانی؛ بیسکاری؛ خەبەر؛ وتەی نارەوا و ناشیرین.

◙ **فحش آب‌نکشیده/ چاروداری**: جنێوی پیس.

**فحشا** / fahšā/: [عربی]/اسم. ڕووسپیگەری؛ حیزی؛ سۆزمانێتی.

**فحش‌کاری** / fohškārî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[گفتاری]* جنێوفرۆشی؛ بیسکاری؛ کارەڕەهاتی جنێو دان؛ ناسزا وتن.

**فحص** / fahs/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کنە؛ منێ؛ کار و ڕەوتی توێژینەوە؛ کۆڵینەوە.

**فحل** / fahl/: [عربی] *صفت.* کەڵ: ١. گیانەوەری نێری خۆ تاوداو بۆ جووت بوون لەگەڵ مێوینەدا ٢. *[مجازی]* هەڵکەوتوو؛ هێزا (بۆ مرۆ).

**فحوا** / fahvā/: [عربی]/*اسم.* ناوەرۆک؛ ناوئاخن؛ کاکڵە؛ مانای نهێنی لە نێوان وتاردا ‹از فحوای کلامش پیدا بود کە پشیمان شده است: لە ناوەرۆکی قسەکانیدا دیار بوو پەشیمان بۆتەوە›: **فحوی**

**فحول** / fohûl, fuhûl/: [عربی]/*اسم.* *[ادبی]* هەڵکەوتوان؛ هەڵبژێراوان؛ هەڵبژاردەیان؛ هۆرکەوتێ.

**فحوی** / fahvā/: [عربی] ☜ **فحوا**

**فخار** / faxxār ، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم.* *[قدیمی]* ۱. کۆزەکەر؛ گۆزەکەر؛ هۆڕەکەر؛ هەوڕگەر؛ ئیربارگەر ۲. کوورەپەز.

**فخامت** / faxāmat/: [عربی]/*اسم.* گەورەیی؛ مەزنایی؛ مەزنی؛ دۆخ و چۆنیەتی گەورە بوون.

**فخر** / faxr ، ـها/: [عربی]/*اسم.* شانازی؛ سەربلندی؛ سەرفەرازی؛ فەخر؛ هەستی هەڤیازی کە لە دارا بوونی شتێ یان جێبەجێ‌کردنی کارێکەوە سەر هەڵدەدا.

◘ **فخر فروختن:** شانازی‌کردن؛ ناز فرۆتن؛ فیزکردن؛ بە خۆوە نازین؛ فەخر فرۆشتن.

**فخر کردن:** نازین؛ نازەی؛ شانازی‌کردن.

**فخرفروشی** / faxrfurûšî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /*اسم.* فیز؛ پۆزنوێنی؛ خۆنوێنی؛ خۆهەڵکێشی؛ کار و ڕەوتی پیشاندانی سەرکەوتنی ڕاستەقینە یان خەیاڵاوی خۆ ‹آدم نوکیسه و تازه به دوران رسیده، به دیگران فخرفروشی می‌کند: مرۆی دەوڵەمەن چلکنی تازەپیاکەوتوو بە سەر خەڵکدا فیز دەکا›.

**فخیم** / faxîm/: [از عربی] *صفت.* *[ادبی]* ۱. گەورە؛ هێژا؛ بەڕێز؛ مەزن؛ مازن ۲. سەربڵند؛ سەرفەراز؛ سەرفیراز؛ سەربەرز.

**فخیمه** / faxîme/: [از عربی] *صفت.* *[ادبی]* ۱. گەورێ؛ هێژا؛ بەڕێز ۲. سەربڵند؛ سەربەرز؛ سەرفەراز. (ئەم وشە بۆ ژنان دەگوترێ).

**فدا** / fadā/: [عربی]/*اسم.* قوربان؛ سەرگەرد؛ گۆری؛ ساقە؛ سەدەقە؛ فیدا؛ فدا؛ خڕ؛ کار و ڕەوتی لە پێناو کەس یان شتێکدا تیدا چوون ‹فدای شما: قوربانی ئێوە›.

◘ **فدا شدن:** فیدا بوون؛ گۆری بین؛ خڕ بین؛ فدا بیەی؛ (بە) سەرگەرد بوون؛ لە پێناو کەس یان شتێکدا بەخت بوون.

**فدا کردن:** فیدا کردن؛ بە قوربان‌کردن؛ گۆری کرن؛ لە پێناو کەس یان شتێکدا بەخت کردن ‹جانش را در راه میهن فدا کرد: گیانی لە ڕێی نیشتماندا فیدا کرد›.

**فدائی** / fadā'î/: [عربی] ☜ **فدایی**

**فداکار** / fadākār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* خۆبەخت‌کەر؛ فیداکار؛ گیان‌لەسەر دەست.

**فداکارانه** / fadākārāne/: [عربی/ فارسی] *قید.* فیداکارانە؛ بە فیدارکاریەوە ‹همه فداکارانه کمک کردند: هەموو فیداکارانە یارمەتیان دا›.

**فداکاری** / fadākārî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* فیداکاری؛ گیان‌بەختی؛ کار و ڕەوتی بەخت کردنی شتی بەنرخ (وەک ماڵ و گیان) لە پێناو کەس یان شتێکدا ‹فداکاری در راه میهن: فیداکاری لە پێناوی نیشتمان›.

**فدایی** / fadāyî ، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم.* فیدایی: ۱. هژمە؛ گۆری و قوربان؛ گیان‌فیدا؛ جان‌گۆری؛ سەرگۆری ۲. ناوی شەڕکەرانی داوخوازی پێشمەرگە لە حکوومەتی نەتەوەیی ئازەربایجان (۱۳۳۵ـ۱۳۲٤) ۳. ئەندام یان هۆگری سازمانی فیداییانی خەلق * **فدائی**

**فدراتیو** / federātîv/: [فرانسوی] *صفت.* فدرالی؛ فدراتیو؛ سەر بە فدراڵ.

**فدراسیون** / federāsyon, fedrās(i)yon ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* فدراسیون؛ ڕێخراوەیێ کە لە چەن ڕێخراوەی بچووکتر پێکهاتووە ‹فدراسیون بین‌المللی کار: فدراسیونی نێونەتەوەیی کار›.

**فدرال** / federāl/: [فرانسوی] *صفت.* فیدراڵ: ۱. فیدارتیو؛ فیدراڵی؛ حکوومەتێکی پێکهاتوو لە چەن دەوڵەتی سەربەخۆی ئەیالەتی و دەوڵەتێکی ناوەندی کە هەڵبژاردەی خەڵکی

هەموو ئەیالەتەکانە ۲. سەر بە دەوڵەتی فیدراڵ ‹پلیس فدرال: پولیسی فیدراڵ›.

**فدرالی** / federālî/: [فرانسوی] *صفت*. فیدراڵ.

**فدوی** / fadavî/: [عربی] *ضمیر*. ئەزبەنی؛ گیان‌فیدا؛ گیانباز؛ ئەزقوربان (وشەی ڕێزنان لە جێی ڕاناوی یەکەم کەسی تاک) ‹فدوی آمادەی هر نوع خدمتی هستم: ئەزبەنی ئامادەی هەموو جۆرە خزمەتێکم›.

**فدیه** / fedye ، ـها/: [عربی] *اسم*. فدیە؛ دارایی و ماڵێ کە بۆ ئازادی کەسێک دەدرێ.

**فـر** / far(r)/: *اسم*. شکۆ؛ مەزناهی؛ هند؛ هنگوونگ؛ هینگ‌ودەنگ؛ فەڕ.

**فر-** / far/: *پیشوند*. ـخاس؛ فەر- ؛ فەڕ- ؛ چاک؛ باش؛ سەر؛ لەسەر ‹فرنام: ناوخاس›.

**فر** / fer ، ـها/: [فرانسوی] *اسم*. فر: ۱. فرۆن؛ فرن؛ جۆرێ کوورەی سەربەسراو ۲. فرموو؛ کەرەستەیەکی کانزایی گەرم بۆ چین و دەقدانی قژ ۳. کەرەستەیەکی وەها کە لە گوڵسازیدا بەکار دێت ٤. چین و دەق.

▣ **فر دادن/ زدن**: فڕدان؛ لوول‌کردن؛ گرنژاندن؛ بادان؛ تاپان؛ نامەتش؛ لوول کەردەی.

**فرا-** / farā/: *پیشوند*. *[ادبی]* ۱. بەرەو- ؛ بەرە- ؛ رووەو- ؛ بەربەژوور؛ ژوورتر ‹فرارو: بەرەورووو› ۲. لە-؛ دا- ؛ لە نێوان‹فراچنگ؛ فراگیر: لەچنگ؛ داگر› ۳. ژوور- ؛ سەرتر ‹فرابنفش: ژووربنەوش› ٤. دەور؛ دەوراندەور‹فرابر: دەوروبەر›.

▣ **فـرا خوانـدن**: خواستنەوە؛ ڤەخواندن؛ ڤەخوەندن؛ بانگێشتن؛ بانگهێشتن؛ بانگ‌کردنەوە؛ چریەی؛ داوای گەڕانەوەی کەسێک بۆ شوێنی کردن ‹فراخواندن سفیر: خواستنەوەی سەفیر›.

**فرا دادن**: هەڵخستن؛ بەرەو بارێک ڕاگرتن ‹گوش فرا دادن: گوێ هەڵخستن›.

**فرا داشتن**: ڕاگرتن؛ چاوەدێری‌کردن ‹گوش فرا داشتن: گوێ ڕاگرتن›.

**فرا رسیدن**: لە ڕێوە هاتن؛ هاتن؛ گەیشتن؛ هاتنە بەرەوە؛ گەیشتنە بەرەوە؛ یاوەی وەرەوە؛ یاوا وەرەوەی ‹بهار فرا رسید: بەهار لە ڕێوە هات›.

**فرا گرفتن**: ۱. فێر بوون؛ مسەی؛ هۆژین؛ مسایش؛ هەڤۆتن ‹فراگرفتن رانندگی: فێر بوونی شۆفێری› ۲. داگرتن؛ ئەرەگێرتەی؛ گێرتەیرە ‹آب همه جا را فرا گرفت: ئاو دنیای داگرت›.

**فرائض** / farā'ez/: [عربی] ☜ **فرایض**

**فرابار** / farābār/: *اسم*. ئەو بەشە لە کەش کە لە چاو دەوروبەری پڕتەوژم‌ترە.

**فرابـر** / farābar/: *اسم*. *[گیاەشناسی]* توێکڵی دەرەوەی بەر؛ توێژی گۆڕدراو و بەرهەمهاتووی ناوکە کە دیواری میوە پێک‌دێنی و برێکی وشک و ڕەق (وەک هی گوێز) و برێکی گۆشتن و ئاودارە (وەک هی هەڵووژە) دەبێتەوە.

**فـرابنفش** / farābanafš/: *اسم*. *[فیزیک]* ژوور بنەوش؛ سەرتر لە تیشکی بەنەوش و خوارتر لە تیشکی ئیکس، کە بە چاو نابینرێ: **فوق بـنفش؛ ماورای بنفش؛ فرابنفش**

**فراپوش** / farāpûš/ ☜ **گُلپوش**

**فراتـاب** / farātāb/: *اسم*. پرۆژێکتۆر؛ ئامرازی نیشاندانی فیلم و سلاید.

**فراتجربـی** / farātacrobî, -tacrebî/: [فارسی/ عربی] *صفت*. ژوورئەزموونی؛ نەک وەها کە بە زانستی ئەزموونی تاقی بکرێتەوە (وەک موعجیزە، کەرامەت و...).

**فراتخم** / farātoxm/: *اسم*. *[گیاەشناسی]* تۆمپۆش؛ پۆشەنی دەرەوەی تۆوی گژ و گیا.

**فراتر** / farātar/: *صفت*. *[ادبی]* ۱. سەرتر؛ ژوورتر؛ بانتر؛ بەرزتر؛ بەرزتەر؛ باڵاتر؛ سەرتەر ‹فراتر از جو: سەرتر لە کەش› ۲. دوورتر؛ دوورتەر؛ دویرتر ‹فراتر از دسترس: دوورتر لە دەسکەوت›.

**فراحسـی** / farāhessî/: [فارسی/ عربی] *صفت*. ژوورهەستی؛ بەدەرلە هەست؛ بە دوور لە

دەسەڵاتی هەست.

**فراخ** / farāx/: *صفت. [ادبی]* هەراو؛ هەرا؛ گوشاد؛ هیرا: ۱. فەرەه؛ فرەه؛ مەبەه؛ پان؛ فرەوان؛ هەڕ و هەراو؛ پان و بەرین؛ بەربلاو؛ بەردار؛ بەرفرەه؛ پەحن ۲. زڕ؛ هەوا؛ ئاواق؛ وڕاق؛ ڤاڵ؛ ولا؛ تاک ‹دهان فراخ: دەمی هەراو›.

**فراخ‌اندیشی** / farāxandîš ، ـها/: *اسم.* بیربازی؛ بیرهەراوی؛ بیربەردایی؛ کار و ڕەوتی بیرکردنەوە بە دوور لە بەرچاوتەنگی و بیرتەسکی بە ڕەچاوکردنی هەموو بەش و لایەنێک. هەروەها: **فراخ‌اندیش**

**فراخنا** / farāxnā ، ـها/: *اسم. [ادبی]* پانایی؛ بەرینی؛ هەراوی.

**فراخوان** / farāxān ، ـها/: *اسم.* بانگهێشت؛ بانگێشت؛ پیووری؛ کار و ڕەوتی بانگ‌کردنی خەڵکی بۆ بەڕێوەبردنی کارێک بە شێوەی داوخواز.

**فراخود** / farāxod/: *اسم. [روانشناسی]* یەکێ لە سێ بەشی زەین لە ڕوانگەی ڕەوانکاویەوە: **منِ برتر**

**فراخور** / farāxor/: *صفت.* شیاو؛ لەبار؛ گونجاو؛ ڕاهاتوو لەگەڵ کەس یان شتێکدا ‹فراخور حال هر کس: شیاوی بار و دۆخی هەر کەسێک›.

**فراخی** / farāxî ، ـها/: *اسم. [ادبی]* ۱. هەراوی؛ بەرینی؛ بەربلاوی؛ هیرایی ۲. گوشادی؛ تاکی.

**فرادست** / farādast ، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* ۱. سەرتر؛ هەڤیاز ۲. بانتر؛ بەرزتر؛ بەرزتەر.

**فرادید**[1] / farādîd/: *اسم.* کار و ڕەوتی دیتنەوە؛ پێدا هاتنەوە.

**فرادید**[2]: *صفت.* ئاشکرا؛ دیار؛ خویا.

**فرار** / farār ، ـها/: [عربی] *اسم.* ڕەڤ؛ هەڕا؛ ڕا؛ فنار؛ ڕەو؛ باز؛ گازە؛ گوزە؛ وا؛ هوونە؛ کار و ڕەوتی هەڵاتن؛ هلاتن؛ هەڵهاتن؛ ڕا کردن؛ ڕەتان؛ دەرچوون؛ دەرچین؛ واین؛ ڕەڤان؛ تەورین؛ فەلتین؛ بازدان؛ بەرشیەی؛ ڕەمەی؛ ڕەمای: ۱. دوور کەوتنەوەی لە ناکاو و خێرا لە شوێنی مەترسی ۲. دەرچوون لە بەر دەست یان چاوەدێری ‹دو تا از مرغها فرار کردند: دوان لە مریشکەکان دەرچوون› ۳. خۆ لە کار یان دۆخێکی دیاریکراو دزینەوە ‹فرار از خدمت: ڕەو لە خزمەت›. هەروەها: **فرار کردن**

▣ **فرار مغزها:** دیاردە یان ڕەوتی دەرچوونی پسپۆڕان لە دامەزراوە، شار یان (بەتایبەت) وڵاتێک.

▣ **فرار را بر قرار ترجیح دادن:** تێ‌تەقاندن؛ پیا پیا هاوردن؛ هەڕا کردن؛ هەڵاتن؛ دەرچوون.

**فرار** / farrār/: [عربی] *صفت. [شیمی]* هەڵچوو؛ هەڵچووگ؛ هەڵبچۆ؛ بە تایبەتمەندی بوونە هەڵم لە گەرمای ئاساییدا (وەک ئەلکول و ئیتیر).

**فراراً** / farāran/: (!)[عربی] *قید.* بە هەڵاتن؛ بە هەڕا؛ بە هەڵات؛ هەڵات ـ هەڵات؛ بە ڕا کردن؛ بەڕەمەی؛ ڕەماینە ‹فراراً خودش را به منزل رساند: به هەڵاتن خۆی گەیاندەماڵەوە›.

**فرارو** / farārow/: *صفت.* سەرڕۆ؛ بالاچۆ؛ ژوورڕۆ؛ بە ڕۆشتنی بەرەو ژوور ‹باد فرارو: بای سەرڕۆ›.

**فرارو** / farārû/: *قید. [ادبی]* لە پێشەڕوو؛ لە پێش؛ لە هەمبەر؛ بەرەوڕوو؛ وەرەنە؛ بەردەم؛ وەرەدەم؛ بەرانبەر ‹مشکلات زیادی را فرارو داشت: گیر و گرفتێکی زۆری لە پێشەڕوو هەبوو›.

**فراروند** / farāravand/ ☜ **فرایند**

**فراری** / farārî ، ـها؛ـان/: [عربی] *صفت.* ۱. هەڵاتوو؛ ڕاکردوو؛ واینی؛ وایەنی ‹زندانی فراری: بەندی هەڵاتوو› ۲. *[مجازی]* بێزار؛ وەڕەز؛ جاڕز؛ وێڕس ‹از مردم فراری است: لە خەڵک بێزارە›.

▣ **فراری بودن:** ۱. لە هەڵاتندا بوون ‹دو سال از سربازی فراری بود: دوو ساڵ لە سەربازی هەڵاتبوو› ۲. *[مجازی]* بێزار بوون؛ وەڕز بوون ‹از کار فراری است: لە کار بێزارە›. هەروەها: **فراری شدن**

**فراری دادن:** دەرکردن: ۱. یارمەتی دان بە کەسێ بۆ دەرچوون ‹زندانی را فراری دادند:

بەندیەکەیان دەرکرد› ٢. ڕەواندنەوە؛ ڕەڤاندن؛ ڕەواندن؛ بوونە هۆی دەرچوونی کەسێ یان شتێک ‹مشتریها را فراری دادی: مشتەریەکانت ڕەواندەوە›.

**فراز** / farāz ، ـها/: *اسم. [ادبی]* ١. هەوراز؛ هەوراز؛ ئەرفاز؛ ئەرواز؛ ئەڤراز؛ ئەڤرازی؛ ئەڤرا؛ هەڤراز؛ فیناز؛ وەزەی؛ بەرزی؛ بلندی؛ هەڵ؛ ڕکە؛ بەرزا؛ بەرزایی ‹نَشیب و فراز: هەوراز و نشێو› ٢. سەر؛ بەرزایی؛ بان؛ ژوور ‹فراز بام: سەر بان› ٣. [فرانسوی] ڕستە؛ هەڤۆک.

**فرازا** / farāzā ، ـها/: *اسم. [ادبی]* بەرزایی؛ بلندایی: ١. بەرزی؛ گازرە؛ گازارە؛ بەرزی لە چاو دەوروبەر ٢. بەرزایی لە ئاست ڕووبەری دەریاوە.

**فراز آب** / farāzāb/: *اسم.* سەراو؛ بەشی سەروو یان دژ بە بزاوی ئاو. بەرانبەر: **فرودآب**

**فرازاسنج** / farāzāsanc ، ـها/: *اسم.* بەرزاییپێو؛ هەورازپێو؛ ئامرازی پێوانی بەرزایی شوێنێک لە ئاستی دەریاوە.

**فرازایاب** / farāzāyāb ، ـها/: *اسم.* هەورازدۆز؛ ئامرازی نیشاندانی بەرزایی شوێنێک لە چاو ئاسۆوە.

**فرازبان** / farāzabān ، ـها/: *اسم.* زمانێ کە بۆ لێدوان لە زمانێکیتر بە کار دێت.

**فرازمینی** / farāzamînî/: *صفت.* ژوورزەوینی؛ بە دەر لە زەوی؛ سە ر بە دەرەوەی گۆی زەوی.

**فرازه** / farāze/ ☜ **غشگیر**

**فراساخت** / farāsāxt ، ـها/: *اسم. [زیستشناسی]* ئانابولیسم؛ ڕەوتی بەرهەم هێنانی ماکی پێویستی لەشی گیانەوەر لەوەی خواردوویە.

**فراست** / farāsat, ferāst/: [عربی]*/اسم.* ١. وریایی؛ هۆشیاری؛ وشیاری؛ زیرەکی؛ هێژایی؛ بزیوی؛ زیتی ٢. ژیری؛ وردی؛ توانای ناسینی شتێک بە هۆی ڕواڵەتیەوە ‹بە فراست مقصودش را از این کار دریافت: بە ژیری زانی مەبەستی لەم کارە چیە›.

**فراسنج** / farāsanc ، ـها/: *اسم.* پێناسە؛ نیشاندەر.

**فراسو** / farāsû/: *قید. [ادبی]* ١. ئەوبەر؛ ئەولا؛ ئەوپەڕ ‹فراسوی دیوار: ئەوبەری دیوار› ٢. لە پشتەوە؛ پشتەسەر؛ پەشتەسەر ‹فراسوی گفتار دلنشین: لە پشتەوەی قسەی دڵبزوێن›.

**فراش** / farrāš ، ـها؛ ـان/: [عربی]*/اسم.* فەڕاش؛ بەردەست؛ سەرایدار؛ پیاوی خزمەتکار.

▣ **فراش پُست**: *[قدیمی]* نامەبەر.

**فراش مدرسه**: خرمەتکاری قوتابخانە؛ خزمەتکارێ کە چاوەدێری و پاکەوانی قوتابخانەی لە ئەستۆدایە.

**فراشد** / farāšod/ ☜ **فرایند**

**فراصوت** / farāsowt, -so:t/: [فارسی/ عربی] ☜ مافوق صوت، **مافوق**

**فراعنه** / farā'ene/: [عربی] جمعِ ☜ **فِرعَون**

**فراغ** / farāq/: [عربی]*/اسم. [ادبی]* ئارخەیانی؛ بێخەموخەیاڵی.

▣ **فراغِ بال**: ڕاحەتی خەیاڵ؛ ئاسوودەیی. هەروەها: **فراغِ خاطر**

**فراغت** / farāqat ، ـها/: [عربی]*/اسم.* ئارخەیانی؛ ئەرخەیانی؛ سونکە؛ سۆنکە؛ ئاشەیسە؛ بار و دۆخی بێخەم و خەیاڵ بوون.

▣ **فراغت داشتن**: ئاسوودە بوون؛ ئارخەیان بوون؛ بێخەم و خەیاڵ بوون. تالا

**فراغت یافتن**: لە کۆڵ کەوتن؛ ئاسوودە بوون؛ دەست خاڵی بوون؛ پابوونەوە؛ لە مل بوونەوە.

**فرافکنی** / farāfekanî ، ـها/: *اسم. [روانشناسی]* دۆخی بیر و بۆچوونی خۆ لە سەرووی هەموو شتێکەوە زانین، بەتایبەت تاوانبارکردن و لۆمەی خەڵک بە هۆی ئەو شێوە بیرکردنەوە.

**فراق** / farāq, ferāq ، ـها/: [عربی]*/اسم. [ادبی]* جودایی؛ جیایی؛ دووری؛ لێکجیایی؛ لێکدووری؛ چۆنیەتی دوورکەوتنەوە لە کەس یان شوێنی خۆشەویست.

**فراقانونی** / farāqānûnî/: [فارسی/ معرب از یونانی] *صفت.* ژوورقانوونی؛ بە دەر لە قانوون؛ بە تایبەتمەندی یان دارا بوونی دەسەڵاتی بانتر (ژوورتر) لە قانوون ‹سازمان‌های فراقانونی: ڕێکخراوەگەلی ژوورقانوونی›.

**فراک** / f(e)rāk ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* فراک؛ جۆرێ کۆتی شۆڕ و ڕەشی پیاوانە کە لە وڵاتانی ڕۆژاوایی لە ڕێوڕەسمی فەرمیدا لە بەری دەکەن.

**فراکسیون** / ferāksiyon, frāksyon ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم. [سیاست]* فراکسیون؛ تاقم؛ دەستە؛ دەستەبەندیەکی دیاریکراو لە ناو بنکەیەکی سیاسی لە لایەن تاقمێکی هاوبیرەوە بۆ بەڕێوە بردنی بەرنامە یان سەلماندنی ئامانجەکانیان.

**فراکشند** / farākešand ، ـها/: *اسم.* هەڵکشە؛ مەد؛ بەرزترین ڕادەی هەڵکشانی توێکڵی زەوی، ڕووبەری ئاو و کەش بە هۆی هێزی ڕاکەشی مانگ و خۆرەوە. بەرانبەر: **فروکشند**

**فراگرد** / farāgard/ ☜ **فرایند**

**فراگشت**/ farāgašt ، ـها/: *اسم. [ادبی]* گۆڕانکاری؛ هەڵوەگەڕی؛ داگەڕی ‹فراگشت ادبی زبان کُردی: گۆڕانکاری وێژەیی زمانی کوردی›.

**فراگیر**[1] / farāgîr ، ـان/: *اسم.* خوێندکار؛ کەسێ کە خەریک فێر بوونە (وەک قوتابی یان بەردەستی کاری پیشەسازی و هونەری).

**فراگیر**[2]: *صفت.* ۱. هەمەلایەنە؛ هەمەلاگر؛ داگر ۲. بەربڵاو؛ پان و بەرین؛ بەرین ‹تحولات فراگیر: گۆڕانکاری بەربڵاو›.

**فراگیری** / farāgîrî ، ـها/: *اسم.* ۱. داگری؛ ڕەژتنەوە؛ بار و دۆخی هەموو لا گرتنەوە؛ لە هەموو لا ڕاگەیشتن؛ هەموو لا گرتن ‹باید میزان فراگیری خدمات رفاهی مورد بررسی قرار گیرد: دەبێ ڕێژەی داگری ڕاژە ئاسایشیەکان بخرێتە بەر لێکۆڵینەوە› ۲. کار و ڕەوتی فێر بوون ‹مدتی به فراگیری زبان فرانسه پرداخت: ماوەیەک خەریکی فێربوونی زمانی فەڕانسە بوو›.

**فراماسون** / f(e)rāmāson ، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* فراماسون؛ ئەندامی ڕێخراوەی فراماسونێری.

**فراماسونری** / f(e)rāmāsonerî/: [فرانسوی]/*اسم.* فراماسونێری؛ تۆڕێکی پان و بەرین لە کۆمەڵەگەلی نهێنی برایەتی لە سەرانسەری دنیادا کە خۆیان بڕوادار بە هێزی ژوورئاسایی، کتێبی ئاسمانی، ملکەچی بۆ قانوونی وڵات، برایەتی جەهانی، ئازادی بیر و بۆچوون دەزانن بەڵام لە بەر ئەوەی ناوبانگی شۆفاریان دەرکردووە، لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا بە دزێوی ناویان لێدەبەن.

**فراملیتی** / farāmellîyyatî/: [فارسی/ عربی] *صفت.* گەلانی؛ چەن‌گەلی؛ چەن‌نەتەوەیی؛ سەر بە چەند وڵات.

**فراموش** / farāmûš/: *صفت.* لە بیرچوو؛ لە بیر کراو؛ لە بیر نەماو؛ لە بیرەو چووگ؛ فەرامۆش.

⊡ **فراموش شدن:** لە بیرکران/ چوون؛ فەرامۆش بوون؛ لە هۆش چوون؛ کوژرەوە بوون؛ ژبیر چوون؛ لە یاد (دەر)چوون/ چوونەوە؛ ژبیر ڤەچوون؛ ژبیرکەتن؛ هۆشەوە شیەی.

**فراموش کردن:** لە بیر بردن؛ لە بیرەو چوون/ بردن؛ فەرامۆش‌کردن؛ ویر شیەیوە.

**فراموشکار** / farāmûškār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* فەرامۆشکار؛ ژبیرکەر؛ بێ‌بیر؛ بێ‌هۆش؛ کەم بیر و هۆش؛ بەتایبەتمەندی لە بیر چوونی پەیتاپەیتا. هەروەها: **فراموشکاری**

**فراموش نشدنی** / farāmûšnašodanî/: *صفت.* لە بیر نەکردنی؛ هەمیشە لە بیر؛ بە تایبەتمەنی لە بیر مان بە هۆی گرنگ بوونی زۆرەوە.

**فراموشی** / farāmûšî ، ـها/: *اسم.* فەرامۆشی؛ ژبیرکەری؛ دۆخی شت لە بیر چوون؛ لێنەهاتوویی لە وەبیر هێنانەوەی ڕووداو و ئەزموونگەلی ڕابردوو.

⊡ **فراموشی آوردن:** ۱. تووشیاری نەخۆشی

فەرامۆشی بوون ٢. هۆی فەرامۆشی بوون.

**به فراموشی سپردن:** لە بیرکردن؛ لە بیرەو بردن؛ لە بیر خۆ بردنەوە؛ بە ئانقەست فەرامۆش‌کردن ‹دعواهای گذشته را به فراموشی سپردند و با هم کاری را شروع کردند: شەڕ و ناکۆکی ڕابردوویان لە بیر کرد و پێکەوە کارێکیان دەست پێ‌کرد›.

**فرامین** / farāmîn/: [معرب از فارسی] جمعِ ☜ **فرمان**

**فرانسوی**[1] / farānsavî/: [فرانسوی]/اسم. فەڕانسەوی: ١. /ـها؛ ـان/ خەڵکی فەڕانسە ٢. زمانی ئەو خەڵکە، لە زمانگەلی هێندوئورووپایی.

**فرانسوی**[2]: صفت. فەڕانسەوی؛ سەر بە فەرانسە ‹غذای فرانسوی: چێشتی فەرانسەوی›.

**فرانسیسکن** / f(e)rānsîskan/: [فرانسوی] ☜ **فرانسیسی**

**فرانسیسی**[1] / f(e)rānsîsî/: [فرانسوی]/اسم. فرانسیسی؛ لقێک لە ڕەبەنانی مەسیحی کاتولیک کە بە دەستی فرانچسکۆی ئاسیسی دامەزرا: **فرانسیسکَن**

**فرانسیسی**[2]: صفت. فرانسیسی؛ سەر بە لقی فرانسیس.

**فرانسیم** / f(e)rānsiyom/: [فرانسوی]/اسم. فرانسیۆم؛ توخمی کیمیایی کانزایی ڕادیۆئەکتیو بە ژمارەی ئەتومی ٨٧ کە بە شێوەی دەسکرد و بۆ بوردمانی توریۆم بەرهەم دێ.

**فرانشیز** / f(e)rānšîz ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. بەشێ لە خەرج (وەک پارەی دەرمان) کە بە پێی هەڵومەرجی بیمەنامە، بە ئەستۆی بیمەدەرە.

**فرانک** / f(e)rānk/: [فرانسوی]/اسم. فرانک؛ پارەی ولاتانی فەڕانسە، بلژیک (پێش یورۆ)، سویس و چەند ولاتی ئەفریقی؛ بەردەستی پێشووی فەڕانسە.

**فراوان** / farāvān/: صفت. زۆر؛ زەبەند؛ فرە؛ فەرە؛ فراوان؛ فریە؛ مشەمەر؛ چەڵ ـ چەڵ؛ کواکوو؛ بە چەندێتی زیاتر لە ڕادەی ئاسایی.

**فراوانی** / farāvānî ، ـها/: اسم. زۆری؛ فرەیی؛ فرەهی؛ لەبەونی: ١. فراوانی؛ مشەمەری ٢. *[آمار]* دووپاتە بوونەوەی دیاردەیێ ‹فراوانی باران: زۆری باران›.

◘ **فراوانی مطلق:** زیاتر دەرکەوتنی دیاردەیەک لە چاو هەموو دیاردەکانی‌تر.

**فراوانی نسبی:** زیاتر دەرکەوتنی دیاردەیەک لە چاو دیاردەیەکی‌تر.

**فراورده** / farāvarde ، ـها/: اسم. بەرهەم؛ داهات؛ هاورد؛ بەروبۆ؛ ئەوەی کە بەرهەم هاتووە.

◘ **فرآوردەی صنعتی:** بەرهەمی پیشەسازی؛ ئەوی بە کاری پیشەسازیەوە دروست بووە.

هەروەها: **فرآوردەی کشاورزی**

**فراهم**[1] / farāham/: اسم. *[گیاه‌شناسی]* بازنە؛ ئاڵقەیەک لە بەشگەلی هاوچەشن (وەک گوڵ) لە دەرەوەی لاسک یان لقێکدا.

**فراهم**[2]: صفت. ١. بەرهەم؛ بەرهەڤ؛ فەرهەم؛ بەرهەمهاتوو؛ فەراهەم؛ وەبەرهاتوو؛ ئامادە؛ تەیار؛ ئابوور؛ دابین ٢. کۆوەبوو؛ کۆمەڵ‌کراو؛ خڕبوو؛ سەریەک‌خراو؛ لەسەریەک‌نراو.

◘ **فراهم آمدن:** *[نامتداول]* کۆوە بوون؛ کۆمەڵ بوون؛ خڕ بوون؛ بەرگهین؛ بەرهەڤ هاتن؛ گلێر بیەیوە.

**فراهم آوردن:** نانە یەکەوە؛ ڤەهەواندن؛ کۆ/ خڕکردنەوە؛ گلێرکەردەیوە؛ لێک کۆکردنەوە؛ هەو خستن؛ وەرەی ئامایش؛ بەرهەڤ‌کرن؛ بەرگهاندن.

**فراهم شدن:** جۆر بوون؛ تەیار بوون؛ ئابووران؛ بەرهەم هاتن؛ پێکهاتن؛ ساز بوون؛ ئەیڤەزین ‹پول مورد نیاز فراهم شد: پارەی پێویست جۆر بوو›.

**فراهم کردن:** سازکردن؛ جۆرکردن؛ ئابوور کرن؛ پێک‌هێنانی کار؛ بەرهەڤ‌کرن؛

ئەیڤەزاندن؛ پێک‌نان؛ نانە یەکەوە؛ نیای ورێو؛ ڕێک وسەی ‹هر طور بود سرپناهی فراهم کردند: هەر چۆنێک بوو کولێنێکیان ساز کرد›.

**فراهمایی** / farāhamāyî ، ـها/:/اسم. کۆڕ: ۱. وتاربێژی ڕەسمی لە لایەن چەن کەسەوە یان بۆ ماوەیەک، لەمەڕ بابەت یا بابەتگەلێکی دیاریکراوەوە ۲. شوێنی بەڕێوە چوونی ئاوا وتاردانێک.

**فرایض** / farāyez/: [عربی] جمعِ ☜ **فریضە: فرائض**

**فرایند** / farāyand ، ـها/:/اسم. ڕەوت؛ گەڕانە؛ ڕەوتانە: ۱. دیاردەیەکی ئاسایی کە گۆڕانکاریەکانی بەرەو ئاکامێکی دیاریکراو دەڕوا و بەوە کۆتایی دێت ۲. زنجیرە چالاکی و کردارگەلێ بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی دیاریکراو: **فراروند؛ فراگرد؛ فراشد**

**فرئون** / f(e)re'on/: [فرانسوی]/اسم. فرێئۆن؛ ناوی بازرگانی دەستەیەک هیدرۆکەربونی هالۆژیندار (پتر لە داڕستەی میتان) بە یەک یان چەن ئەتومی فلوئووروەوە کە لە دەزگاگەلی سەرماسازدا بە کار دێت.

**فربه** / farābe(h) ، ـها؛ ـان/: صفت. [ادبی] چاخ: ۱. گۆشتن؛ گۆشتین؛ گۆشتێن؛ تێرگوشت؛ پڕگۆشت؛ بگۆشت؛ قەڵەو؛ قەڵەڤ؛ کۆلارە؛ هەملک؛ سێروونی ؛ چاخچڵ؛ مەس؛ گلوول؛ پاسۆتی؛ تێردۆن؛ بەزدار؛ تێربەز؛ چەوور ۲. [ادبی] ساق؛ ساخ؛ ساغ؛ لەش‌ساغ. هەروەها: **فربه بودن؛ فربه شدن؛ فربه کردن**

**فربهی** / farbehî/:/اسم. ۱. چاخی؛ قەڵەوی ۲. [ادبی] ساقی؛ ساخی؛ ساغی.

**فرترن** / fortran/: [انگلیسی]/اسم. فورترەن؛ یەکێ لە زمانگەلی بەرنامەنووسی کەمپیوتەر: **فُورترن**

**فرت ـ فرت** / fertfert/: صوت. مشەمش؛ مشە؛ دەنگێ کە لە کاتی ئەنجامدانی کارێکدا لە لووتەوە دەردێ ‹همه‌اش داشت فرت‌فرت می‌کرد: هەر مشەمشی دەهات/ دەکرد›.

**فرتوت** / fartût/: صفت. [ادبی] فەرتووس؛ فەرتووت؛ پەککەوتە؛ پەککەوتوو: ۱. ـها؛ ـان/ زورهان؛ ڕەندۆڵ؛ ڕەندول؛ لاکەوتە؛ هەری‌مەندش ‹پیر فرتوت: پیری زورهان› ۲. [نامتداول] لەکارتە؛ پڕتۆک؛ ڕزیو؛ ڕندۆڵ؛ تیتڵە؛ لە کار کەوتوو.

**فرتوتی** / fartûtî/:/اسم. زورهانی؛ فەرتووتی.

**فرج** / farac/: [عربی]/اسم. ڕۆشنایی؛ گوشادی؛ فردقی؛ فەرحانی ‹صبر کن! شاید فرجی بشود: سەبر کە! ئەوخوایە ڕۆشناییەک بکرێتەوە›.

**فرج** / farc ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. [ادبی] پز؛ قوز؛ کوز؛ کوسی؛ کوس؛ کس؛ ڤرچک؛ شەرمگا؛ شەرمگە؛ شەرمی ژن ۲. زهێ؛ زەها؛ زێ؛ خەمشە؛ بۆچ؛ سیت؛ هوولە ماڵ؛ ماڵە؛ ئەندامی زاوزێی گوانداری مێوینە.

**فرج** / forac/: [عربی] جمعِ ☜ **فرجه**

**فرجام** / farcām/:/اسم. ۱. ئاکام؛ سەرئەنجام؛ دوایی؛ دمایێ؛ پەرتاڵ؛ پرتۆڵ؛ چەخەر؛ هەدرەش؛ شەوت؛ دویماهیک؛ ئاخری هەر کارێ ‹خوش فرجام: خۆش ئاکام› ۲. [حقوق] دواپێدا چوونەوە؛ ئاخر پێدا هاتنەوەی حوکمی دەرکراو لە دادگای لێکۆڵینەوەدا.

▣ **فرجام خواستن:** داوای لێکۆڵینەوەکردن بۆ ئاخرجار لە دادگادا.

**فرجام یافتن:** تەواو بوون؛ بڕانەوە؛ دوایی هاتن؛ دمەین ئامەی؛ قەدان؛ هەرادیای؛ تەمامیەی.

**فرجام‌شناسی** / farcāmšenāsî/:/اسم. ئاکام‌ناسی: ۱.ئامۆژەیێک کە دیاردە بەبۆنەی هۆکارەکەیەوە ڕوون دەکاتەوە ۲. ئامۆژەیێ کە سروشت و ڕەوتە سروشتیەکان وەکوو ئامانجێکی لە پێش دیاریکراو دادەنێت ❋ **غایت‌شناسی**

**فرجه** / force ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. / فُرَج/ تلیش؛ قلش؛ قەڵش؛ قەڵشت؛ درز؛ دەرز؛ ترەکە؛ مەودا یان هەرۆڵی نێوان دوو لێوارە ۲. دەرفەت؛ هەل؛

مۆڵەت ‹ده روز فرجه بدهید تا پولتان را پس بدهم: ده ڕۆژم دەرفەت بدەن تا پارەکەتان بدەمەوە› ۳. [ریاضی] کونجی بەینی دوو پەڕە.

**فرچه** / ferče ، ـها/: [ترکی]/اسم. فلچه؛ فرچە؛ بەتارە؛ گزکچە؛ گزکەچە؛ بەفش؛ کەرەستەیەک بە چەپکێ ڕیشاڵە و دەسکێکی بچووکەوە بۆ پێداساوین یان گزگ دان ‹فرچەی ریش‌تراشی: فلچەی ڕیش‌تاشین›.

**فرح** / farah/: [عربی]/اسم. [ادبی] شادی؛ شادومانی؛ دڵخۆشی؛ دلخوەشی؛ شایی.

**فرح‌افزا** / farahafzā/: [عربی/ فارسی] صفت. گەشێنەر؛ گەش‌کەر؛ پڕشادی.

**فرح‌انگیز** / farahangîz/: [عربی/ فارسی] صفت. شادی‌هێن؛ شادی و خۆشی بزوێن.

**فرحبخش** / farahbaxš/: [عربی/ فارسی] صفت. شادی‌دەر.

**فرحزا** / farahzā/: [عربی/ فارسی] صفت. وەدیهێنەری شادی.

**فرخ** / farx/ ☜ **سوف‌ماهی**

**فرخ** / farrox/: صفت. [ادبی] بە ودم؛ فەڕدار؛ پیرۆز؛ مبارەک؛ ممبارەک؛ فەرخ؛ هەزەخ.

**فرخندگی** / farxondegî/: اسم. پیرۆزی؛ مبارەکی؛ بەودمی؛ هەزەخی.

**فرخنده** / farxonde/: صفت. بەودم؛ پیرۆز؛ هەزەخ؛ بەفەڕ؛ مبارەک؛ هومایون ‹جشن فرخنده: جەژنی بەودم›.

**فرخی** / farroxî/: اسم. [ادبی] پیرۆزی؛ هەزەخی؛ مبارەکی؛ ممبارەکی.

**فرد**[1] / fard/: [عربی]/اسم. تاک: ۱. / افراد/ کەس؛ تا؛ تەن؛ یۆ؛ مرۆڤ بێ‌ڕەچاوکردنی تایبەتمەندیەکانی ‹هر فرد بالغ حق دارد مستقل زندگی کند: هەر کەسێکی پێگەیشتوو مافی ژیانی سەربەخۆی هەیە› ۲. [ادبی] فەرد؛ شیعرێ کە تەنیا تاقە بەیتێکە ۳. / افراد/ [زیست‌شناسی] تا؛ تەن؛ یۆ؛ هەر کام لە ئەندامانی کۆمەڵێک ٤. [نجوم] ئەستێرەیەکی ڕووناک لە کەلووی ئاوماردا.

**فرد**[2]: صفت. تاک؛ تاق: ۱. تاکانە؛ بێ‌هاوتا؛ تاقانە ۲. ژمارەیەک کە نەبێتە دوو بەشی بەرامبەری ساقەوە؛ بەرامبەر جووت.

◙ **فرد اعلی**: بێ‌هاوتا؛ تاکانە؛ بێ‌هاوماڵ لە چاکیدا ‹ گز فرداعلی: گەزی بێ‌هاوتا›.

**فردا**[1] / fardā/: اسم. بەیانی؛ سبەی؛ سەبەی؛ سوبێ؛ سوبە؛ سبەینێ؛ سبەونە؛ سبێ؛ سبە؛ سبیانێ؛ سوبیانێ؛ سبحەی؛ سحا؛ سۆح؛ سۆحا؛ سبحا؛ سبحە؛ سبحەینێ؛ سۆ؛ سو؛ سوو؛ سووا؛ سەوا؛ سوبا؛ سارە؛ سەبا؛ سوە؛ سوەی؛ سۆیە؛ سوب؛ سۆزی؛ سەیزوو؛ مەشت؛ مەشتە؛ مەشتی؛ مەشیت؛ مەست؛ مەستە؛ سینەو؛ ڕۆژی دوایی: ۱. ڕۆژی پاش ئەمڕۆ ‹فردا روز دیگری است: بەیانی ڕۆژێکی دیکەیە› ۲. دوا؛ ڕۆژی پاش ڕووداوێک ‹فردای عروسی: سۆحای زەماوەن› ۳. /ـها/ [مجازی] داهاتوو ‹باید به فکر فردا هم بود: دەبێ سبەیشمان لە بیر بێ›.

**فردا**[2]: قید. بەیانی؛ سۆزی؛ سبەینێ؛ سوا؛ سبە؛ سۆحا؛ سەبەی؛ سوەی؛ مەشتە؛ مەستە؛ سەوا؛ سینە: ۱. لە ڕۆژی دوای ئەمڕۆدا ‹فردا با هم می‌رویم گردش: بەیانی پێکەوە ئەڕۆین بۆ سەیران› ۲. لە کاتی داهاتوودا ‹اگر فردا پشیمان شوی و بخواهی برگردی، فایده ندارد: ئەگەر سۆزی پەشیمان بیەوە و بتەوێ بگەڕێیتەوە، کەڵکی نیە›.

**فرداشب**[1] / fardāšab/: اسم. سبەی‌شەو؛ سۆزی‌شەو؛ سەبەی‌شەوێ؛ سەوای‌شەوێ؛ شۆڤیتر؛ شەوێ دوای ئەمشەو ‹فرداشب، شب دوشنبه است: سبەی شەو، شەوی دووشەمبەیە›.

**فرداشب**[2]: قید. سۆزی‌شەو؛ سبەی‌شەو؛ سەبەی شەوێ؛ لە شەوی دوای ئەمشەودا ‹فرداشب برمی‌گردد: سۆزی‌شەو دێتەوە›.

**فرداًفرد** / fardanfard/: [عربی] قید. یەک بەیەک؛

ئێک ـ ئێک؛ یەکە بە یەکە؛ کەس بەکەس؛ یۆـیۆ؛ یوەـیوە؛ یەکەـیەکە؛ تاکەـتاکە؛ تەک بەتەک؛ دانەبەدانە ‹فرداًفرد مورد بازرسی قرار گرفتند: یەک‌بەیەک سەنگ و سۆژن کران›.

**فردسم** / fardsom ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* یەکسم؛ یەکسمە؛ بەشی لە چوارپێیان (وەک ئەسپ و کەر) کە سمیان یەک تیکەیە.

**فردگرا** / fardgerā ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* تاکەخواز؛ تاکواز؛ خاوەنی خۆ یان هۆگری تاکەخوازی.

**فردگرایی** / fardgarāyî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* تاکەخوازی؛ تاکوازی: ۱. ئامۆژەیێ کە قازانجی تاکەکەس و کۆمەڵگا بەرامبەر دەزانێ و ڕێگای بەخت بوونی تاک بۆ کۆمەڵ نادا ۲. ئامۆژەیێ کە تاکەکەس بە سەرچاوکەی هەموو بایەخ، ماف و ئەرکێک دەناسێ ۳. ئامۆژەیێ کە بۆ تاکەکەس، سەربەخۆیی ڕامیاری و ئابووری و بۆ داهێنان و قازانج و کردەوەکانی بایەخێکی زۆر دادەنێ * اصالت فرد ٤. واز لە کار و بڕیاری تاکەکەسی بەبێ هاوکاری و هاوبیری.

**فردوس** / fedows, ferdo:s/: [معرب از فارسی] *اسم. [ادبی]* بەهەشت؛ بەهشت؛ بوهشت؛ بهەشت؛ فردەوس؛ فیردەوس.

**فردی**[1] / fardî/: [عربی] *صفت.* تاکەکەسی: ۱. کەسی؛ فەردی؛ سەر بە تاک یان پێوەندیدار بە تاکەوە ۲. تەنیا ‹این نتیجەی اقدام فردی است: ئەمە ئاکامی کاری تاکەکەسیە›

**فردی**[2]: *قید.* بە تەنێ؛ تەنیایی؛ تاکەکەسی؛ تەنیابالی؛ تەنیا؛ بە تاک؛ بۆ خۆ ‹فردی عمل کردم: بە تەنێ کارم کرد›.

**فردیت** / fardîyyat/: [عربی]/*اسم.* تاکێتی؛ تاکیەتی.

**فرز** / ferz ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* کرژ؛ توند؛ گورج؛ فرز؛ فیرز؛ لەش‌سووک؛ چوست؛ چست؛ تاشک؛ لۆپت؛ لۆبت؛ گوربز؛ گورج‌وگۆڵ؛ کرژ و کۆڵ ‹آزاد واقعاً فرز است: ئازاد بەڕاستی کرژە›.

**فرز** / f(e)rez ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* فریز؛ جۆرێک ماشینی برین و تاشینی ئامێرگەلی کانزایی.

**فرزان** / farzān/: [از کردی]/*اسم. [نامتداول]* فەلسەفە؛ حیکمەت.

**فرزانگی** / farzānegî/: [از کردی]/*اسم.* مژیوەری؛ ژیری.

**فرزانه**[1] / farzāne ، ـها؛ ـگان/: [از کردی]/*اسم.* ۱. *[ادبی]* کەسێ کە خاوەنی هۆش و عەقڵ و زانستی باشە ۲. حەکیم؛ فیلەسووف ‹فرزانەی نیشابور: ژیری نەیشابور›.

**فرزانه**[2]: *صفت.* ژیر؛ مژیور؛ چاوکراوە؛ لە دنیا زان؛ تێگەیشتوو؛ ئاوەزمەند؛ فرە زانا.

**فرزکاری** / f(e)rezkārî ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] /*اسم.* فریزکاری؛ ڕەوتی کارکردن بە ماشینی فریز. هەروەرها: **فرزکار**

**فرزند** / farzand ، ـها؛ ـان/:/*اسم.* ڕۆڵە؛ ڕوولە؛ چێلە؛ بێچوو؛ فرزەند؛ لامی؛ منال؛ مندال؛ مەندال؛ ئەولاد؛ شاخە؛ زارۆ؛ زاڕۆ؛ زارو؛ زارۆلە؛ زاولە؛ زا؛ زار؛ زادە: ۱. بێچووی کەسێک ۲. ئەوەی لە دایک و باوکێکەوە دەبێ ۳. *[مجازی]* لە دایک بووی شوێنێک ‹فرزند شاهو: ڕۆڵەی شاهۆ›.

**فرزندخواندگی** / farzandxāndegî/:/*اسم.* زڕمندالی؛ گۆردەیی ‹او را به فرزندخواندگی پذیرفت: بە زڕمندالی خۆی وەریگرت›.

**فرزندخوانده** / farzandxānde ، ـها؛ ـگان/:/*اسم.* زڕمندال؛ یەخەکێشیاگ؛ کەسێ کە لە لایەن ژن و پیاوێکەوە بە مندالی وەرگیراوە.

**فرزندسالاری** / farzandsālārî/:/*اسم.* زارۆمەزنی؛ مندال‌سالاری: ۱. بەدەم مندالەوەدانی زۆر و ناڕەوا لە لایەن دایک و باوکەوە ۲. بار و دۆخی کۆمەڵگای وا کە دەبیتە هۆی سەربزێوی مندالان.

**فرزندی**[1] / farzandî/:/*اسم.* مندالی؛ منالی؛

زاوڵەیی؛ زارۆیی؛ بار یان دۆخی منداڵ بوون ‹به فرزندی پذیرفتن: به منداڵی وەرگرتن›.

**فرزندی**[2]: *صفت.* منداڵی؛ لەمەڕ منداڵـەوە ‹مهر فرزندی: خۆشەویستی منداڵی›.

**فرزی** / ferzî/: *اسم.* گـورجی؛ کـرژی؛ تاشـکی؛ گوربزی؛ گـورج‌وگۆڵـی؛ کـرژ و کۆڵـی؛ لـۆپتی؛ لۆبتی؛ توندی؛ فرزی؛ لەش‌سووکی.

**فرزین** / farzîn/: *اسم.* فـەرز؛ فـەرزین؛ وەزیـری مۆرەی شەترەنج.

**ـ فرسا** / farsā/: *پیوَژه.* ـ پـرووکێن؛ ـ داوەشـێن؛ ـداڕزێن؛ ـدافەتێن ‹جان‌فرسا: گیان‌پرووکێن›.

**فرساب** / farsāb/: *اسم. [زمین‌شناسی]* ڕەوتی ساویانەوە؛ لووس بـوونی ڕووی بـەفرەچاڵ یـان بەردی چۆم بە هۆی بزاوی ئاوەوە.

**فرس‌اعظم** / farasea'zam/: [عربـی]/*اسـم.* کەلوویـەکی گـەورەی ئاسمـانی لـە ئاسمـانی لەتەگۆی باکووریدا.

**فرسایش** / farsāyeš/: *اسـم.* ١. کـار و ڕەوتی پرتووکـان؛ پۆزنکـان؛ داڕزان؛ داوەشـان؛ پـوان؛ پووکان ٢. *ـها/[زمین‌شناسی]* چۆنیـەتی گـۆڕانی بیچمـی توێکڵـی زەوی بـە هـۆی بـا و بـاران و سەرما و گەرماوە.

**فرسایشی** / farsāyešî/: *صـفت.* داڕزێنانـە؛ تایبەتمەندی وردە‌ـوردە لە بەریەکەوە پرتووکان.

**فرساینده** / farsāyande، ـها؛ ـگان/: *صفت.* پوێنەر؛ پووکێنەر؛ پرتووکێنەر؛ داڕزێنەر؛ داوەشێنەر ‹کار فرساینده: کاری پوێنەر›.

**فرسپس** / forseps، ـها/: [فرانسوی/انگلیسی]/*اسم. [پزشـکی]* پێگـر؛ ئـامرازێ وەکـوو پـەنس یـان ئامۆردەستی بۆ گرتن یان ڕاگرتن، بەتایبەت لـە برینگەریدا.

**فرستادن** / ferestādan/: *مصـــدر. متعـــدی.* //**فرستادی**: ناردت؛ **می‌فرستی**: دەنێری؛ **بفرست**: بنێره// ناردن؛ بەڕێ کـردن؛ شـاندن؛ شـەهاندن؛ هنـارتن؛ هـەناردن؛ ڕەوانـەکردن؛ کـل کـردن؛ ڕەوان؛ کیاسـتەی؛ کیاسـتن؛ کیانـای؛ سـانەی؛ کیاسەی. هەروەها: **فرستادنی**

■ صـفت فـاعلی: **فرسـتنده** (ـــ)/ صـفت مفعـولی: **فرستاده** (ناردراو)/ مصدر منفی: **نفرستادن** (نەناردن)

**فرستاده** / ferestāde، ـها؛ ـگان/: *اسم.* ڕاسـپاردە؛ ڕاسـپارە؛ ڕاسـپێراو: ١. نـاردراو؛ نێـردراو؛ بەڕێ‌کراو؛ ڕەوانەکراو؛ ناریاگ؛ هنارتی؛ فرستادە؛ هـەناردوو؛ هـەناردی؛ هـەناری؛ کەسـێ کـە بـۆ ئەنجامدانی کارێک بەتایبەت وت‌وویژ لە لایـەن دامـەزراوەیەکـەوە بـۆ شـوێنێک دەنێردرێـت ٢. سەفیر؛ باڵوێز.

**فرستنده** / ferestande، ـهـا/: *اسـم.* بنێـر؛ دەزگایەک کە بە کەڵک وەرگرتن لـە شـەپۆلی ئلیکترومیغناتیسی، دەنگ یان دیمەنی لەبار بـۆ گرتن، بلاو دەکاتەوە.

⊡ **فرستندەی تلویزیونی**: دەزگایێ کە دەنـگ و ڕەنگ بە شێوەی شەپۆلی ئلیکترۆمیغناتیسـی دەنێرێتە سەر وەرگری تەلەڤیزیۆنیەوە.

**فرستندەی رادیویی**: دەزگایێ کە هەواڵ یـان بەرنامـەی ڕادیـۆیی بـە شـێوەی شـەپۆلی ئلیکترۆمیغناتیسی دەنێرێتـە سـەر وەرگـری ڕادیۆییەوە.

**فرسخ** / farsax، ـهـا/: [معرب از فارسـی]/*اسم.* فرسەخ؛ فرسەق؛ فرسەنگ؛ مەودایەکی مێژینەی ڕێگایە بەرانبەر بە شەش کیلۆمیتر.

**فرسک** / f(e)resk، ـها/: [؟]/*اسم.* نەخشـەدیوار؛ نیگارکێشی سەر دیوار.

**فرس‌ماژور** / forsmājûr/: [؟]/*اسم.* زەبر و زەنگ؛ گوشار؛ تەوژم.

**فرسنگ** / farsang، ـهـا/: *اسم. [ادبی]* فرسـەخ؛ فرسەنگ.

**فرسودگی** / farsûdegî، ـهـا/: *اسم.* کرووچـی؛ سـواوی؛ پـواوی؛ داڕزاوی؛ کـۆنی؛ کۆنـەیی؛ لەکارکەوتەیی.

**فرسودن** / farsûdan/: *مصـدر. لازم. متعـدی*

//**فرسودی**: سـوای؛ **می‌فرسـایی**: دەسـوی؛ **بِفرسـا**: بسوو// □*لازم*. ١. سوان؛ پوان؛ دارِزان؛ کرووچان؛ کرچیان؛ کرمنشین؛ فەتان؛ دافەتان؛ دافـەتیان؛ پۆزنکان؛ داوەشان؛ داوەشیان؛ قنانەوە؛ (دا)قنان؛ پچکان؛ پرووسکان؛ ڕێزایرە؛ ئەرەڕێزەی؛ وریایرە؛ شـنیایرە؛ ژەڤ‌کـەتن؛ بـە هـۆی کـاری زۆر و دژوارەوە لە کارکەوتن ٢. پرِوسـکان؛ بـە هـۆی تەوژمی جەسـتەیی و ڕۆحیـەوە، هێـز و گـوڕ و گەشـەی خـۆ لـە دەسـتدان ٣. پرووسـکان؛ داقنان؛ بە هۆی کارکردنی زۆر یان هۆکارگـەلی لە پەستا، نژم و دۆخی ئاسایی خـۆ لـە دەسـت دان □*متعدی*. ٤. کەس یـان شـتێک بـە هـۆی کاری زۆر و دژوارەوە لە کار خستن ٥. بە هـۆی تـەوژمی جەسـتەیی و ڕۆحیـەوە کەسـێک لـە نەشەوگەشە خستن ٦. پەلەخاندن؛ بـە کەلـک وەرگرتن لە هۆکارگەلی لەپەستا، نـژم و دۆخـی ئاسایی شتێک نەهێشتن. هەروەها: **فرسودنی**

■ صـفت فـاعلی: **فرسـاینده** (ـــ)/ صـفت مفعـولی: **فرسوده** (سواو)/ مصدر منفی: **نفرسودن** (نەسوان)

**فرسوده** / farsûde ، ـها/: *صفت*. ١. سواو؛ کرووچ؛ کرِووز؛ کرِووزە؛ پەرِپووت؛ پاسـفندە؛ کەرخـەپ؛ ڕووزە؛ ڕووزەڵە؛ پوترگە؛ چلیس‌کسە؛ قەشـیای؛ لەکارکەوتوو بە هۆی کاری زۆر دژوارەوە ٢. شـرِ و شیتاڵ؛ شرِ و شیواڵ؛ ڕووزە؛ ڕووزەڵە؛ سست و داپلۆخاو بە هۆی وە بەر هێز و گوشـارِ کـەوتنی لەپەستا ٣. بێ‌نەشە و گەشە بە هـۆی گوشـاری جەستەیی یان دەروونی بەردەوامەوە. هەروەها: **فرسوده بودن؛ فرسوده شدن؛ فرسوده کردن**

**فرش** / farš ، ـها/: [عربی]/*اسم*. فەرش: ١. ڕایەخ؛ گەوە؛ چنراو یان تەنراوی تایبەت بۆ ڕاخستن ٢. تـەخت‌پـۆش؛ ئـەوەی تـەختی شـوێنێکی پـێ دادەپۆشن (وەک: بەرد، سـیمان، موزاییـک و...) ٣. ☜ **قالی**

⊡ **فرش ماشینی**: قالی ماشینی.

⊡ **فـرش انـداختن**: قالـی ڕاخسـتن؛ فـەرش داخستن؛ قالیەرە وسەی؛ قالی یاوایرە.

**فرش کردن**: ڕاپۆشین؛ فەرش‌کـردن؛ شـوێنێ بە فەرش داپۆشین.

**فرش** / forš ، ـها/:/*اسم*. لم؛ لمت؛ خاکەبـەردێک وردتر لە خیز و درشت‌تر لە خۆڵ (وردتر لە ٠,٠٣ میلی‌میتر) کە لە بەستێنی چۆم، گـۆم و زەریـادا دەنیشێ.

**فرشباف** / faršbāf/: [عربی/ فارسی] ☜ **قالیباف**

**فرشبافی**/ faršbāfî/: [عربی/ فارسی] ☜ **قالیبافی**

**فرشته** / fērešte ، ـها؛ ـگان/:/*اسم*. پـەری؛ فرشـتە؛ فریشتە: ١. *[دین]* بوونەوەرێکی ئاسمانی کە هێز و عەقلی زۆرتر لە مرۆیە و گوناشـی پـێ نـاکرێ ٢. *[مجـازی]* مـرۆی خـوێن‌شـیرین و بـاش ٣. *[مجازی]* زەری؛ کچی جوان و بێ‌کەمایەسی.

**فرش‌فروشی** / faršforûšî/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **قالی‌فروشی**

**فرشـینه** / faršîne ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/*اسـم*. ١. فەرش‌ئاسا؛ ژێرڕاخەر؛ لە سەر دارقالی تـەنراو (وەک: بەڕە، سوجادە و...) ٢. موکیت.

**فرصـت** / forsat ، ـهـا/: [عربـی]/*اسـم*. دەرفـەت؛ هەل؛ هەڤـراز؛ هولـل؛ فرسـەت؛ قانـگ؛ کـێس؛ کیس؛ کەیس؛ فەرسەند؛ پەردێژ؛ هـۆ؛ هـەڕەت؛ ئەختان؛ قیس؛ چـەل؛ دەلـف؛ دەلیڤـە؛ وچـان؛ لـیڤ؛ بـوارە؛ مـەزال؛ بـیڤ؛ سـۆنکە؛ سـۆنگە؛ هەڵـکەوت؛ ورنــەک؛ بـاو؛ ڕاو؛ ئـەوڕاو؛ دەرب؛ هەرات: ١. ماوەیێ کە بـۆ کـەس یـان کارێـک تەرخان دەکرێ ⟨تا انتخابات ده روز فرصت باقیست: بۆ هەڵبژاردن دە ڕۆژ دەرفەت ماوە⟩ ٢. قـان؛ قـام؛ قاف؛ گورد؛ پلـە؛ پـەرژ؛ کـەلێن؛ کـاتی گونجـاو ⟨امروز فرصت خوبی بـرای اسـتراحت اسـت: ئـەوڕۆ بـۆ حەسانەوە هەلێکی باشە⟩.

⊡ **فرصت پیدا کردن** ☜ **فرصت کردن/ یافتن**

**فرصـت دادن**: دەرفـەت دان؛ دوڤ بـەردان؛ ماوە پێ‌دان ⟨باید به او فرصت داد تـا آمـاده شـود: دەبێ دەرفەتـی بدرێتێ تا ساز ببێ⟩.

فرصت داشتن: پەرژان؛ پەرژین؛ پەردەژیان؛ پەرێژیان؛ پەردەچیەی؛ پەردەچیای ‹فرصت ندارم: نامپەرژێ›.
فرصت را غنیمت شمردن: هەل بە دەرفەت زانین؛ کات بە هەل زانین ‹فرصت را غنیمت شمردیم رفتیم دیدن موزه: هەلمان بە دەرفەت زانی و چووینە سەیری مۆزە›.
فرصت سر خاراندن نداشتن: *[کنایی]* وەختی سەرخوراندن نەبوون؛ کات بۆ نەمان؛ زۆر سەرقاڵ بوون.
فرصت کردن/ یافتن: دەست گەیشتن؛ فرسەت هەبوون؛ بۆ پەرژان؛ لێ ئانین؛ هەل ڕەخسان؛ بۆ ڕەخسین؛ بۆ هەڵکەوتن؛ کێس ئانین؛ پەردەچیای؛ دەرفەت دەسکەوتن ‹اگر فرصت کردی این مقاله را بخوان: ئەگەر دەستت گەیشت ئەم وتارە بخوێنەوە›: **فرصت پیدا کردن**
**فرصت‌طلب** / forsat.talab ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* هەل‌پەرست؛ هەل‌خواز؛ کەیسۆ.
**فرصت‌طلبی** / forsat.talabî ، ـها/: [عربی]*/اسم.* هەل‌خوازی؛ هەل‌پەرستی؛ کار و ڕەوتی کەڵک وەرگرتنی ناڕەوا لە بار و دۆخ و ڕووداوان.
**فرض** / farz ، ـها/: [عربی]*/اسم.* فەرز: ۱. بابەتێ کە بۆ مەبەستێک بە ڕاستی دانین بێ ئەوەی سەلمابێ؛ کار و ڕەوتی دانان؛ گرتن ‹فرض کن تابستان است: وادانە هاوینە› ۲. پێویست؛ واجب ‹این کار بر من فرض است: کردنی ئەم کارە بۆ من پێویستە›.
▣ بر فرض: بگرە؛ بە فەرز؛ وەبزا؛ وابزا؛ وەبزانە ‹بر فرض نخواستی، می‌توانی پس بدهی: بگرە نەتویست، دەتوانی بیدەیەوە›.
▣ فرض بودن: لە سەر بوون؛ ئەرکی سەرشان بوون؛ فەرز بوون؛ واجب بوون ‹بر همە فرض است کە بە همنوع خود کمک کند: لە سەر هەموو کەسێکە یارمەتی هاوماڵی خۆی بدا›.
فرض دانستن: ئەرکی سەرشان زانین؛ فەرز زانین؛ واجب زانین.
فرض کردن: وا دانان؛ واگرتن؛ دانان؛ فەرز کردن ‹فرض کنیم فردا تو را از کار بیرون کردند: وادانین بەیانی لە کار دەریان کردی›. هەروەها: **فرض شدن**
**فرضاً** / farzan/: [عربی]*قید.* گریمان؛ کردمان؛ بگرە؛ هما؛ هاما؛ تەقا؛ تەقوو؛ هاتوو؛ ئەگەرکوو؛ گری؛ بەفەرز؛ فەرزەن؛ با وای دانێین ‹فرضاً چهار نفر مهمان آمد، باید کجا بنشینند؟: گریمان چوار میوان هات، لە کوێ دانیشن؟›.
**فرضی** / farzî/: [عربی]*قید.* گریمانەیی ‹دشمن فرضی: دژمنی گریمانەیی›.
**فرضیات** / farzîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **فرضیه**
**فرضیه** / farzîyye ، ـها؛ فرضیات/: [عربی]*/اسم.* گریمانە: ۱. بۆچوونێ کە بۆ بەدەستهێنانی بەرهەم یان ئەزموونێک پەسن کراوە ‹او بە فرضیەی توطئه معتقد است: ئەو بڕوای بە گریمانەی پیلانە› ۲. بڕوا یان حوکمی نەسەلمێندراو کە بۆ دۆزینەوەی سەرچاوە یان هۆی دیاردەیەک پەسند دەکرێ ‹فرضیەی سرآغاز جهان: گریمانەی سەرەتای جەهان›.
**فرط** / fart/: [عربی]*/اسم.* زۆری؛ فرەیی؛ ئەوپەڕ ‹از فرط گرسنگی داشت از پا در می‌آمد: لە زۆری برسیەتیدا خەریک بوو دەمرد›.
**فرع** / far' ، ـها؛ فروع/: */اسم.* ۱. لق‌وپۆ؛ فەرع؛ لک؛ پەل؛ ئەوەی پاشکۆ یان بەشێک لە شتێکی دیکە بێ ‹باباجان شیرینی و میوه فرع است، فکر نهار باش!: کاکەگیان میوە و شیرینی لق و پۆیە، بیر لە فراوین بکەوە!› ۲. دەسکەوت؛ قازانج؛ خێر؛ دەسهات؛ هاقڵ ‹اصل و فرع سرمایه سوخت: دەسمایە و دەسکەوت فەوتا› ✻ بەرانبەر: **اصل**
**فرعون** / fer'own, fer'o:n ، ـها؛ ـان؛ فراعنه/: [معرب از یونانی]*/اسم.* فیرعەون؛ فرعەون؛ ناوی پاشایانی میسری کەونارا.
**فرعونی** / fer'ownî, fer'o:nî/: [معرب] *صفت.*

فیرعەونی؛ سەر بە فیرعەون.

**فرعی** / far'î/: [عربی] *صفت.* ناسەرەکی؛ فەرعی؛ پەلی؛ لقی: ١. بەستراو بە شتێکەوە یان پاژێک لە شتێک ‹عضو فرعی: ئەندامی ناسەرەکی› ٢. سەرچاوەگرتوو یان دروستبوو لە شتێکی تر ‹خیابان فرعی: شەقامی فەرعی› ٣. *[مجازی]* ناگرینگ؛ کەمبایەخ ‹کارهای فرعی: کاروباری ناسەرەکی› ✽ بەرانبەر: **اصلی**

**فرعیات** / far'îyyāt/: [عربی] *اسم.* لقوپۆ؛ شتانی کەمبایەخ و ناسەرەکی.

**فرغاریدن** / farqārîdan/: *مصدر. متعدی.* *[قدیمی]* گەوزانـدن؛ خووسـاندن؛ فیسـاندن؛ پلنگـانن؛ ئالشتەی؛ شتێ لەناو تراوێکدا نوقمکردن.

**فرغـردن** / farqardan/: *مصـدر. لازم.* *[قـدیمی]* گەوزان؛ خووسان؛ خووسیان؛ فیسیان؛ فیسیەی؛ تێکەڵاو بوونی شتێ لەگەڵ تەوشێکدا.

**فرغن** / forqon/: [از فرانسوی] ☜ **فرغون**

**فرغـون** / forqûn ، ـها/: [از فرانسـوی] *اسـم.* عەرەبانە؛ فرغوون؛ ڤالاکەر؛ گوهێز؛ ئامرازێکی گچکەی یەک کەسی بە چەرخێک و دووپایە و دوو دەستەوە بۆ گواستنەوەی خاک و بەرد و زبڵ و زاڵ: **فرغُن؛ فرقون؛ فرقُن**

**فرفره** / farfare/: *اسم.* تەپڵەڕەش؛ گیایەک بە ریشەی پتەوی گۆشتن و گەڵای گەورە و پانەوە کە بۆ دەرمان دەشێ.

**فرفره** / ferfere ، ـها/: *اسم.* سوڕسوڕە؛ خولخولە؛ خولخولۆکە؛ خولۆتە؛ خولەوتلە؛ هەر کام لەو لەیستۆکانە وا بە دەوری خۆیاندا سووڕ دەخۆن: *الـف)* گوزمیچـک؛ گوزمیرچـک؛ شـێلاقە؛ کۆلەتراش؛ گاوەبۆرگێ؛ بۆریە؛ نەعۆر؛ لەیستۆکی زۆرتر لە چێو تاشراو، هەیەتی ناوی هەلکۆشاوە، پەتی بە دەوردا دەپێچێتەوە و بە تەوژمەوە دایدەدەن سووڕ دەخوا و دەبۆڕێنێ (وەک مەرزێح و گیزگیزە) هەیشە بە قەمچی لێدەدەن سووڕ دەخوا (وەک کەرخول) *ب)* گێژەگ؛ فرفرە؛ فرفرۆکە؛ فرفرۆک؛ فرفرۆک؛ باڕێسە؛ گەڕ؛ گیزگیزە؛ گڤگە؛ گڤگڤە؛ زڤرۆک؛ بافرنەک؛ خزینگ؛ جۆرێ ئامزاری گەمەیە بە کاغەز و مقەبای ڕەنگی دروست دەبێ، با لێی بدا دەسووڕێتەوە.

**فرفری** / ferferî/: [فرانسوی] *صفت.* لوول؛ کرژ؛ گرژ؛ فرفری ‹پسر مو فرفری: کوری قژ لوول›.

**فرفیون** / farfîyûn ، ـها/: [لاتینی] *اسم.* شۆتیلە؛ خوشیلە؛ خوشیلک؛ خوشیل؛ خوژیل؛ خوژیلک؛ خشیلک؛ خشیلکە؛ خوشولک؛ خوشوول؛ قوشیلک؛ شیرقولی؛ شیرخوژیلک؛ شیرشیرۆکە؛ شیرمار؛ قەلەشۆتی؛ شوتکیلە؛ ماmووتە؛ گیایەکی ئالفی پاییە بە شیلەی سپی ژاراوی و گولی چەتریەوە.

**فـرق** / farq ، ـهـا/: [عربـی] *اسـم.* فـەرق: ١. جیاوازی؛ تۆفیر؛ تەوفیر؛ نابەرامبەری نێوان دوو یان چەند شت، لە باری چەندێتی یان چۆنیەتیەوە ‹قیمتشان فرق دارد: نرخیان جیاوازی هەیە› ٢. تەوق سەر؛ بوولیە؛ بۆلی؛ تەوقەتە؛ تەپڵ؛ تۆقیلە؛ تەوقەسەر؛ تۆقەسەر؛ تەپڵەسەر؛ تەپڵی سەر ٣. ناوەڕاستی سەر؛ هێڵێ کە لە داهێنانی قژە سەر بە دوو لادا بەرچاو دەکەوێ: **فرق سر**

◙ **فرق سر** ☜ **فرق ـ ٣**

◙ **فرق باز کردن:** فەرقکردنەوە؛ قژ دوو قاش کردن؛ فەرق ڕاسەوکردن؛ جۆکلە ڕاسەوە ئاسەی ‹از پهلوی سر فرق باز کرده بود: لە پاڵەوە فەرقی سەری کردبووە›.

**فرق داشتن:** جیاوازی بوون؛ فەرق هەبوون.

**فرق کردن:** گۆڕان؛ فەرقکردن ‹قیافه‌اش خیلی فرق کرده بود: سەر و سیمای زۆر گۆڕا بوو›.

**فرق گذاشتن:** جیاوازی دانان؛ دووچاوەکی ڕوانین؛ فەرق خستن؛ تەوفیر نان؛ وەک یەک نەڕوانین لە شت/ کەسانێک ‹او میان بچه‌هایش فرق می‌گذاشت: لە نێوان منداڵەکانیدا

جیاوازی دادەنا›.

**فرق** / feraq/: [عربی] جمعِ ☜ **فرقه**

**فرقان** / forqān/: [عربی]/اسم. فورقان؛ یەکێ لە ناوەکانی قورئان.

**فرقدان** / farqadān/: [عربی]/اسم. [نجوم] جووتەی کەو؛ جووتەی کەوان؛ دووبرالە؛ ناوی دوو ئەستێرە لە کەلووی ورچی بچووکدا.

**فرقن** / forqon/: [از فرانسوی] ☜ **فرغون**

**فرقون** / forqûn/: [فرانسوی] ☜ **فرغون**

**فرقه** / ferqe ، ـها؛ فِرَق/: [عربی]/اسم. کۆمەڵە؛ دەستە: ١. گرۆیەک لە خەڵک کە شوێنکەوتووی ئایین یان بڕوایێکی دیاریکراون ٢. ڕێکخراوە و بنکەی سەر بە دەستەیەکی وا.

**فرقه‌گرایی** / ferqegerāyî ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. دەستەخوازی؛ دەسەوازی؛ واز بۆ بەدیهێنانی کۆمەڵێکی نوێ پتر بە جیا بوونەوە لە گرۆی پێشوو.

**فرکانس** / f(e)rekāns ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. فرێکانس؛ لەرە؛ ژمارەی ئەو جارانە کە دیاردەیەکی گەڕۆک لە یەکەیەکی کاتیدا دەگاتەوە سەر شوێنی سەرەتایی خۆی.

**فرکند** / farkand ، ـها/:/اسم. [زمین‌شناسی] ڕەندۆڵ؛ کەناو؛ ئاودڕی گەورەی لە دۆڵ چکۆلەتر.

**فرگشت** / fargašt ، ـها/:/اسم. تەواوکاری؛ ڕەوتی گووران.

**فرم** / form ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. فۆرم؛ فورم؛ فرم: ١. بیچم؛ نژم؛ شێوە یان حاڵەتی شتێ ‹فرم موهایش را عوض کرده بود: بیچمی قژی گۆڕابوو› ٢. یونیفورم؛ جلکی فەرمی یەکدەست ٣. بەرژەنامە؛ پرسیارنامە؛ پەڕەیێکی چاپی بۆ نووسینی زانیاری داواکراو لەمەڕ کەس یان شتێکەوە ٤. چەند (١٦یان ٨) لاپەڕەی کتێب کە پێکەوە چاپ دەبن.

◘ **فرم پرکردن:** فۆرم/ بەرژە پڕکردنەوە؛ نووسینی زانیاریگەلی داواکراوی ناو پرسیارنامە.

**فرم دادن:** فۆرم پێدان؛ شێوە پێدان؛ بە شێوە یان حاڵەتێکی تایبەت دەرهێنان. هەروەها: **فرم گذاشتن**

**ـ فرما** / farmā/: پیواژە. ـ فەرما؛ ـ فرما؛ فرماندەر ‹کارفرما؛ حکمفرما: کارفەرما؛ حوکمفەرما›.

**ـ فرمائی** / farmā'î/ ☜ **ـ فرمایی**

**فرمالدئید** / formālde'îd/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] فورماڵدیئید؛ گازێکی بێڕەنگە بە بۆنێکی تایبەتەوە کە پتر وەک پێکوژی میکرۆب لە دژگەنکاری و هەڵگرتنی نموونەی شانەییدا کەڵکی لێ وەردەگرن: **فرمیک آلدئید**

**فرمالیته** / formālîte/: [فرانسوی]/اسم. فۆرمالیتە: ١. تەشریفاتی ٢. [مجازی] ڕواڵەتکاری؛ ڕواڵەتسازی * **فورمالیته**

**فرمالین** / formālîn/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] فورمالین؛ ناوی بازەرگانی گیراوەی ٤٠٪ی فورماڵدئید لە ئاودا، کە نەختێ متانولیشی تێکەڵ کراوە: **فُرمِل**

**فرمان** / farmān ، ـها/:/اسم. فەرمان؛ فرمان: ١. / فرامین/ فەروار؛ فەرک؛ فەرکان؛ ئەمر؛ دەستوور؛ قسە یان نووسراوەیەک کە بە پێی ئەوە کارێک لە ژێردەستێک داواکراوە ٢. فەرمانە؛ کەرەسەیەک لە ماشیندا کە ئاژۆر بە سووڕدانی ئەملا و ئەولا دەکا.

◘ **فرمان بردن:** گوێ شل بوون؛ فەرمان بردن؛ قەوڵ کردن ‹آزاد از کسی فرمان نمی‌برد: ئازاد گوێی بۆ کەس شل نیە›.

**فرمان دادن:** دەستوور دان؛ فەرمان دان/ داین؛ فەرکاندن ‹به سربازان خود فرمان حمله داد: بە سەربازەکانی فەرمانی دا هێرش بەرن›.

**پشت فرمان نشستن** ☜ **پشت**[٢]

**دست به فرمان داشتن** ☜ **دست**

**فرمانبر** / farmānbar ، ـها؛ ـان/:/اسم. ئەمربەر؛ بەربار؛ فەرمانبردار؛ فەرمانبەر؛ فرمانبەر؛

ژێـردەس؛ ژێردەسـت؛ ژێردەسـتە؛ ژێردەسـە؛ کەسێ کە بەر فەرمانی کەسێکی‌ترە.

**فرمـانبردار** / farmānbordār ، ـها؛ ـان/:/اسم. بەرفـەرمان؛ فەرمانبـەردار؛ گـوێ بەفـەرمان؛ گوێڕایەڵ.

**فرمـانبرداری** / farmānbordārî ، ـهـا/:/اسم. گوێڕایەڵی؛ بەفەرمانی؛ بەرفەرمانی.

▣ **فرمانبرداری کردن:** بە قسە کردن؛ گوێ شل کردن؛ ملدان؛ فەرمانبەری‌کردن.

**فرماندار** / farmāndār ، ـها؛ ـان/:/اسم. فەرماندار؛ فرماندار؛ هۆمان: ١. ئەوەی سەرۆکایەتی هێـزی بەڕێوەبەری شارێکی لە ئەستۆدایە ٢. سـەرۆکی هێزی بەڕێوەبەری پارێزگایەک (لە ئەمریکادا).

▣ **فرماندار کل:** فەرمانداری گشـتی؛ نوێنـەری شای بریتانیا لە بـڕێ ولات (وەک ئوسترالـیا و کانادا).

**فرمانـدار نظـامی:** سـەرپەلێکی چەکـدار کـە حکوومـەت یـان ئاسایشـی ناوچەیـەکی لـە ئەستۆیە.

**فرمانــــداری** / farmāndārî ، ـهــا/:/اسـم. فەرمانداری؛ فرمانـداری: ١. پیشـەی فەرمانـدار ٢. مەزرینگەی کارکردنی فەرماندار ٣. ناوچـەی ژێر دەسەڵاتی فەرماندار.

**فرمانده** / farmānde(h) ، ـان/:/اسم. سـەرکردە؛ سەرپەل؛ فەرماندە؛ فەرماندەر؛ فرمانڕوا؛ فرماندار؛ کەسێ کە سـەرۆکایەتی و ڕێبـەری گرووپێکـی چەکداری وەئەستۆیە.

**فرماندهی** / farmāndehî/:/اسم. ١. کار و ڕەوتی فـەرمان دان ٢. سـەرکردایەتی؛ پیشـە یـان مـەقامی فەرمانـدەر ٣. سـەرکردایەتی؛ شـوێنی کاری سەرکردە.

**فرمـانروا**[1] / farmānravā ، ـیـان/:/اسم. ڕاژۆر؛ ڕاسـەر؛ حـاکم؛ فەرمانـڕەوا؛ خونکـەر؛ خونکـار؛ سان؛ پاتشای گەورە؛ خاوەن فەرمان ‹فرمـانروای یونان: ڕاژۆری یۆنان›.

**فرمانروا**[2]: *صفت.* زاڵ؛ چێر؛ چیر ‹سکوت بـر خانـه فرمانروا بود: بێ‌دەنگی بە سەر ماڵەکەدا زاڵ بوو›.

**فرمـــانروایی** / farmānravāyî ، ـهـا/:/اسم. دەسـەڵاتداری؛ دەسـداری: ١. کـار و ڕەوتی حکوومـــەت‌کـــردن ٢. دەسـرۆیوی؛ دەستڕۆیشتوی؛ چێری و زاڵی.

**فرمانفرمـا** / farmānfarmā ، ـها؛ ـیـان/:/اسم. *[قـدیمی]* پـارێزەر؛ ئوسـتاندار؛ فەرمانـدەر و بەڕێوەبەری پارێزگا یان ئەیالەتێک.

**فرمـایش** / farmāyeš ، ـهـا؛ ـات/:/اسم. لـەبز؛ فەرمایشت؛ فـەرمایش؛ وارم؛ گوتـە؛ فـەرموودە؛ فەرمودە؛ کەلام؛ قسـە یـان فـەرمانی کەسـێکی گەورەی خاوەن ڕێز.

▣ **فرمـایش فرمـودن:** فـەرموون؛ فەرمایشـت کردن؛ قسەکردن ‹فرمـایش فرمودنـد **فعلاً صبر کنید:** فەرموویان جارێ ڕاوەستن›.

**فرمایشـی** / farmāyešî/: *صـفت.* هەڵبەسـتراو؛ ڕاسپارە؛ ڕاسپاردە؛ ئامادەکراو بە پێـی فـەرمانی کەسـێ ‹انتخابـات فرمایشـی: هەڵـبژاردنی هەڵبەستراو›.

**ـفرمایی** / farmāyî/: *پیواژە.* ـفەرمایی؛ ـفرمایی؛ فەرمان دان: **ـ فرمائی**

**فرمل** / formel/: [فرانسوی] ☜ **فُرمالین**

**فرمنــد** / farmand/: *صـفت. [ادبـی]* خـاوەن دەسـەڵات و هێـزی ڕاکێشـانی هـۆگری، گـوێڕایەڵـی و متمانـەی دیتـران. هـەروەها: **فرمندی**

**فرمودن** / farmûdan/: *مصدر. متعدی.* // **فرمودی:** فەرمووت؛ **می فرمایی:** دەفەرمووی؛ **بفرما:** بفـەرموو// فـەرموون؛ فـەرمین؛ فـەرماوەی؛ فـەرماوای؛ وارمای: ١. وتن؛ گوتن (ڕێزگرانـە) ‹فرمودنـد فـردا بیایید: فەرموویان بـەیانی وەرن› ٢. سـەبارەت بـە کەسێ یان بە گوێرەی شتێ، کارێ‌کردن ‹تأکید فرمودند: جەختیان فەرموو›. هەروەها: **فرمودنی**

■ **صفت فاعلی: فرماینده** (ـ)/ **صفت مفعولی: فرموده**

(فەرمواو)/ مصدر منفی: **نفرمودن** (نەفەرموون)

**فرموده** / farmûde ، ـها/:/اسم. فەرمایشت؛ دەستوور؛ فەرمووده ‹بە فرمودەی آقای مدیر: بە فەرمایشتی ئاغەی بەڕێوەبەر›.

**فرمول** / formûl ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. فورمووڵ: ١. *[ریاضی]* بنەمایێ کە پتر بە نیشانەگەلی بیرکاری دەردەبڕدرێ ‹فرمول دوجملەای: فورمووڵی دووڕستەیی› ٢. *[شیمی]* شاندانی پێکهاتەیەکی شیمیایی بە شێوەی نیشانە ‹فرمول اسید سولفوریک: فورمووڵی سوولفوریک ئەسید› ٣. ڕێچارە؛ شێوەی چارەسەری گرفت و پرسێک ‹هنوز فرمولی برای این کار نداریم: هێشتا ڕێچارەیەکمان بۆ ئەم کارە نیە› * **فورمول**

▣ **فرمول ساختاری/ ساختمانی/ گسترده:** *[شیمی]* فورمووڵی بڵاو/ ساختومانی؛ فورمووڵێکی وا کە زیاد لە ژمارە و جنسی ئەتومەکان، چۆناوچۆنی پێکەوە لکانیشیان نیشان دەدا.

**فرمول‌بندی** / formûlbandî ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. فرمووڵڕێژی؛ ڕێکخستنی شێوە و دەستوورێکی تایبەت بۆ دیاردە یان کارێک.

**فرمیکا** / formîkā/: [انگلیسی]/اسم. فورمیکا؛ جۆرێک فیبری رووکێش‌کراوی بریکەدار: **فورمیکا**

**فرمیک آلدئید** / formîk 'ālde'îd/: [فرانسوی]
☜ **فرمالدئید**

**فرمیم** / fermiyom/: [فرانسوی]/اسم. فرمیوم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی ڕادیۆئەکتیف بە ژمارەی ئەتۆمی ١٠٠ کە بە شێوەی دەسکرد و لە بوردومانی پلۆتونیوم دێتە بەرهەم.

**فرنج** / ferenc ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. کۆتی نیوەبەژنی چەکداری بە چوار گیرفانەوە.

**فرنجمشک** / farancmešk, farancmešg ، ـها/: /اسم. فاتمەداروو؛ فاتمەهاروو؛ هەنگەبەر؛ ڕێحانەمێخەکی؛ گوڵەبەنۆشەک؛ گوڵەبۆنەشکە؛ گیایەکی یەکساڵەی هەمیشە سەوزی عەتراوی بە گەڵای هێلکەیی و گوڵی بنەوشەوە کە گەڵاکانی بۆ دەرمان دەشێ.

**فرنگ** / farang/: [از فرانسوی]/اسم. ١. ڕۆژاوا؛ فەرەنگ؛ ناوی گشتی هەر کام لە وڵاتانی ئورووپا (و بڕێ جار ئەمریکا) ٢. *[موسیقی]* گۆشەیێ لە دەسگای هومایون و ڕاست‌پەنجگا.

**فرنگستان** / farangestān/: [از فرانسوی/ فارسی] /اسم. وڵاتی ڕۆژاوا؛ هەر کام لە وڵاتانی ئورووپا.

**فرنگی**[1] / farangî ، ـها؛ ـان/: [از فرانسوی]/اسم. ڕۆژاوایی؛ فەرەنگی؛ هەر کام لە خەڵکی وڵاتە ئورووپاییەکان (و بڕێ جار ئەمریکا).

**فرنگی**[2]: *صفت.* ڕۆژاوایی؛ فەرەنگی؛ سەر بە فەرەنگ ‹آداب و رسوم فرنگی: ڕێوڕەسمی فەرەنگی›.

**فرنگی‌مآب** / farangîma'āb ، ـها/: [از فرانسوی/ عربی] *صفت.* ئورووپاییانە؛ بە ئاکار و شێوەی فەرەنگیان.

**فرنی** / fer(e)nî/:/اسم. فرنی؛ محەللەبی؛ شۆتینە؛ خواردەمەنیەکی شل لە ئاردەبرینج (یان نشاستە)، شیر و شەکر و گوڵاو و بڕێ جاریش وانیل بۆ بۆنخۆش‌کردنی.

**فرو ـ** / furû, forû/: *پیشوند. [ادبی]* ١. خوار ـ؛ ـخوار؛ وار ـ؛ ـوار؛ ـنزم ‹بخش فرودست رودخانە: بەشی خواردەستی ڕووبار› ٢. دا ـ؛ ئەرە ـ؛ ـ بن؛ ـ ژێر؛ ـخوار؛ بەرەوخوار ‹فروافتادن: داکەفتن› ٣. تێ ـ؛ تێوە ـ؛ تێهەڵ ـ؛ تێڕۆ ـ؛ ئەنە ـ؛ ـ نا؛ بۆ ناوەوە یان بەرەو ناخ ‹فروبردن: تێ‌بردن› ٤. ژێر ـ؛ خوار ـ؛ وار ـ؛ چێر ـ؛ بن ـ؛ خاوەن بارودۆخی ژێردەست بوون ‹فرودست: ژێردەست›.

▣ **فرو افتادن:** کەوتنە خوار؛ داکەوتن؛ داکەفتن؛ کەوتەیرە؛ کەوتەرەی؛ وەرسان؛ وەرسیان ‹سیبی از درخت فروافتاد: سێوێک لە دارەکە داکەوت›. هەروەها: **فرو افکندن**

**فرو بردن:** ١. کردنە ناو؛ تێخستن؛ ڕۆکردن؛ پێداکردن؛ ڕۆچواندن؛ چقنن؛ وانن؛

ئەنەکەردەی ‹سرش را در آب فرو برد: سەری کردە ناو ئاوەکەوە› ٢. *[گفتاری]* قووت دان؛ داعوویران؛ داعووران؛ هاپنەی؛ لەپنەی؛ هشاڤتن؛ داقورچاندن؛ داقورتاندن؛ قورچاندن؛ داقورتان؛ قورتاندن؛ ڕۆهێشتن؛ حەپەلووش کردن.

**فرو بستن:** قونجاندن؛ قووچاندن؛ لێک نان؛ نەگاندن؛ قووجنەی؛ بەستن ‹دم فرو بستن: دەم قونجاندن›.

**فرو پاشیدن:** هەڵوەشانەوە؛ لێک هەڵوەشان؛ لێک بەر بوون؛ لە یەک بوونەوە؛ بلاو بوونەوە؛ پژیان؛ زەنگار-زەنگار بوون ‹ فرو پاشیدن اتحاد شوروی: هەڵوەشانەوەی یەکیەتی سۆڤیەت›.

**فرو خوردن:** خواردنەوە؛ قووت دانەوە؛ واردەیوە؛ نیشان نەدانی هەستی خۆ ‹خشم خود را فرو خوردن: ڕقی خۆ خواردنەوە›.

**فرو رفتن:** تێچوون؛ تێڕۆچوون؛ ئەنەلوەی؛ لواینە: ١. پێدا چوون؛ چوونە نێو یان نێوانی شتێکەوە ‹سوزن فرورفتن: دەرزی تێچوون› ٢. بە شتێک داگیران یان وەبەر کارتێکەری شتێ کەوتن ‹در افکار دور و درازی فرورفته بود: چووبووە ناو خەیالاتێکی دوور و درێژەوە›.

**فرو ریختن:** ١. دارمان؛ دارمیان؛ رمیان؛ ڕووخیان؛ ڕووخان؛ خاپوور بوون؛ هاتنە/ ڕژانە خوار؛ وڕای؛ تێکچوون ‹ساختمان بە آن بزرگی یکبارە فرو ریخت: ساختومانی وا گەورە بەجارێک دارما› ٢. داکەوتن؛ وەرین؛ داوەرین؛ داوەریان؛ وەرهین؛ ئەرەرێژنەی؛ ڕێزنایرە؛ جیا بوونەوە لە بەرزاییەک و هاتنە خوار ‹سنگ‌های زیادی از کوه فروریختە بود: بەردێکی زۆر لە کێوەکەوە داکەوتبوو›.

**فرو شدن:** ١. ڕۆچوون؛ تێچوون؛ لوایرە؛ نوقم بوون؛ قوم بوون؛ چوونە خوار و گم بوون ‹باران بند آمد و آب در عمق زمین فرو شد: باران وێستایەوە و ئاو ڕۆچوو بە ناخی ئاخا› ٢. ئاوا بوون؛ داچوون؛ نیشتەی؛ وەستەیرە ‹خورشید در پس کوەها فرو شد: تاو لە پشتی کێوانەوە ئاوا بوو› ٣. داوەراندن؛ داوەرانن؛ هەڵڕژاندن؛ هەڵڕژانن؛ هەڵڕژتن؛ هەڵڕشتن؛ داباراندن؛ دابارانن ٤. دارماندن؛ دارمانن؛ داڕووخاندن؛ هەرفاندن؛ هەرفتاندن؛ هەرافتن ٥. دارژاندن؛ ڕژاندن؛ ڕژانن؛ بەردانەوە؛ بەرەودان ‹اشک فرو ریختن: فرمێسک دارژاندن›.

**فرو کردن:** تێ چەقاندن؛ پێدا/ پیا چەقاندن؛ پێداکردن؛ تێڕۆکردن؛ ئەنەوسەی؛ ئەنەکەردەی؛ تێ بردن؛ کردنە ناو؛ بردنە ناو؛ وستەینە؛ کەردەینە؛ بە زۆرەوە بردنە ناو ‹سوزن را بە دستش فرو کرد: دەرزیەکەی چەقاندە دەسیا›.

**فرو گذاشتن:** بەرەڵلا کردن؛ بەرهەڵدا کردن؛ هێشتنەوە؛ وێڵ کردن؛ ئاستەیوە؛ ئەوەئاسەی؛ هەروا لێی گەڕان و لێ نەپرسین ‹کار را فرو گذاشت و رفت: کارەکەی بەرەڵلا کرد و ڕۆیشت›.

**فرو ماندن:** دامان؛ تێدامان؛ تێمان؛ ئەنەمەنەی؛ مەنایوە ‹فرو ماندە در قیمتش مشتری: کڕیار لە نرخاندنیدا داماوە›.

**فرو نشاندن:** دامرکاندن؛ داتەمراندن؛ داسەکاندن؛ داسەکناندن؛ نیشنایوە؛ کوشنایوە ‹آتش فرو نشاندن: ئاور دامرکاندن›.

**فرو نشستن:** نیشتنەوە؛ دامرکان؛ داتەمران؛ نیشتەیوە؛ کوشیایوە ‹فرو نشستن طوفان: نیشتنەوەی گژەبا›.

**فرو هشتن:** ١. داهێلان؛ داهێشتن؛ ڕۆهێشتن؛ دائینان؛ داڕۆچکاندن؛ داڵۆچانن؛ شۆڕ کردنەوە ٢. داڵۆچان؛ نکسین؛ لەفین؛ شۆڕ بوونەوە.

**فروارد** / forvārd ، ـها/: [انگلیسی] *اسم. [ورزش]* پێشڤە؛ فوروارد؛ یاریزانی لە پێش و هێرشبەری یاری: **فوروارد**

**فروافتادن** / furûoftādan/ ☜ **فرو ـ**

**فروبار** / furûbār/: *اسم.* شوێنێ لە کەش کە لە

چاو شوێنەکانی‌تر تەوژمی کەمترە.

**فروبردن** / furûbordan/ ☜ **فرو ـ**

**فروبستن** / furûbastan/ ☜ **فرو ـ**

**فروپاشی** / furûpāšî ، ـها/: *اسم.* تێکڕووخاوی؛ هەڵوەشاوی؛ هەڵشیواوی؛ تێکشیواوی؛ تێکچوویی؛ کار و ڕەوتی هەڵوەشانەوە؛ ڕووخان؛ تێکچوون و پرژ و بڵاو بوونەوەی شتێک ‹فروپاشی قدرت: تێکڕووخاوی دەسەڵات›.

**فروپاشیدن** / furûpāšîdan/ ☜ **فرو ـ**

**فروتر** [1] / furûtar/: *صفت. [ادبی]* خوارتر؛ وارتەر؛ نزمتر؛ نزمتەر؛ نەوی‌تر.

**فروتر** [2]: *قید. [ادبی]* بۆ لای خواروو؛ بەرەو خوار؛ خوارتر؛ وارتەر.

**فروتن** / furûtan, forûtan ، ـها؛ ـان/: *صفت.* خاکەسار؛ خاکی؛ خۆشکێن؛ بێ‌منیز؛ بێ‌فیز.

**فروتنی** / furûtanî, forûtanî ، ـها/: *اسم.* خاکەساری؛ خۆشکێنی؛ بێ‌دەماری.

**فروختن** / furûxtan, forûxtan/: *مصدر. متعدی.* // **فروختی**: فرۆشتت؛ **می‌فروشی**: دەفرۆشی؛ **بفروش**: بفرۆشە// فرۆشتن؛ فرۆتن؛ ورەتەی؛ فرووشین: ١. شتێک بە کەسێ دان لە بەرامبەر گرتنی دراو یان شتێکی بایەخدارەوە ‹کتاب را ده هزار تومان فروختم: کتێبەکەم فرۆشت بە دە هەزار تمەن› ٢. شتێک بۆ فرۆشتن خستنە بەر چاو ‹قصد دارد خانه را بفروشد: دەیەوێ ماڵەکە بفرۆشێ› ٣. نواندن؛ نیشاندان؛ پیشاندان ‹اِفاده فروختن: ئەتوار نواندن› ٤. شتێ بە هیوای شتێ‌تر یان لە بەرانبەی شتێ‌ترەوە بەتایبەت بە شێوەیەکی ناشیرین و ناڕەوا دان ‹خود را فروختن: خۆ فرۆشتن›. هەروەها: **فروختنی**

■ **صفت فاعلی: فروشنده** (فرۆشەر)/ **صفت مفعولی: فروخته** (فرۆشراو)/ **مصدر منفی: نفروختن** (نەفرۆشتن)

**فروخوردن** / furûxordan/ ☜ **فرو ـ**

**فرود** / furûd, forûd ، ـها/: *اسم.* نزمی؛ نزمان ‹فراز و فرود: بەرزی و نزمی›.

◘ **فرود آمدن**: ١. نیشتنەوە؛ نیشتن؛ نشایش؛ نزم بوونەوە؛ نیشتەیوە؛ وارنایش؛ هاتنە خوار ‹هواپیما در صحرا فرود آمد: فڕۆکەکە لە سارادا نیشتەوە› ٢. *[ادبی]* دابەزین؛ داوەزین؛ داخۆزین؛ ئەرەوەسەی؛ وەستەیرە؛ هاتنە خوار؛ ئامایرە وار.

**فروداب** / furûdāb, forûdāb/: *اسم.* بەشی ژێرەوەی ئاو کە هاولایەنی ئاوە. بەرانبەر: **فرازاب**

**فرودست** / furûdast ، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* خواردەست: ١. ژێردەست؛ بەردەست؛ بەردەس ٢. ژێرین؛ خوارین؛ وارین.

**فرودگاه** / furûdgāh, forûd- ، ـها/: *اسم.* فڕگە؛ نهشتۆک؛ فڕۆکەخانە؛ فڕۆکخانە؛ نیشتنگا؛ دام و دەزگایەک بە ئاقارێکی بەرباز، بورجی چاوەدێری، دەزگاگەلی هەواڵ ڕاگوێز و شتی وا بۆ نیشتنەوە و هەستانی فڕۆکە و سوار بوون و دابەزینی ڕێبوارانی هەوایی.

**فروردین** / farvardîn/: *اسم.* نەورۆز مانگ؛ خاکەلێوە؛ ئاخەلێوە؛ ئاخلێڤە؛ ئاخلێڤ؛ ئاخلێڤە؛ قاتەلێوە؛ قاتەولێوە؛ هەرمێ پشکوان؛ یەکەمین مانگی ساڵی جەلالی، هەوەڵ مانگی بەهار.

**فرورفتگی** / furûraftegî ، ـها/: *اسم.* قوپاوی؛ تێڕۆچوویی؛ داچوویی؛ قووڵکایی؛ فیس؛ چاڵی بەدیهاتوو لە ڕووبەرێکدا ‹روی گونەاش فرورفتگی بە چشم می‌خورد: لە سەر گۆنایەوە قوپاویەک بەدی دەکرا›.

**فرورفتن** / furûraftan/ ☜ **فرو ـ**

**فرورو** / furûrow/: *صفت.* دابەز؛ بە جوولەی بەرەوخوار.

**فروریختن** / furûrîxtan/ ☜ **فرو ـ**

**فروزان** / furûzān, forûzān/: *صفت. [ادبی]* گەش؛ ڕۆشن؛ ڕووناک بە هۆی داگرسانەوە ‹آتش فروزان: ئاوری گەش›.

**فروزنده** / furûzande, forûzande/: *صفت. [ادبی]*

گەش؛ ڕۆشن؛ ڕووناک؛ درەوشاوە؛ پرشنگدار.

**فروسرخ** / furûsorx, forûsorx/: اسم. خوارسوور؛ لە ژێر تیشکی سوور کە بە چاو نابینرێ: **مادون قرمز**

**فروش**[1] / furûš, forûš، ـها/: اسم. فرۆش؛ فرووش: ۱. کار یان ڕەوتی فرۆشتن؛ فرۆتن ‹فروش نقد: فرۆشی نەخت› ۲. داهاتی فرۆشتنی کالا ‹فروش این مغازه در ماه ۱۰۰ هزار تومان است: فرۆشی ئەم دووکانە لە مانگدا ۱۰۰ هەزار تمەنە›.

⊡ **فروش داشتن:** فرۆش هەبوون؛ خاوەن کڕیار بوون ‹این مغازه فروش خوبی دارد: ئەم دووکانە فرۆشی باشی هەیە›.

**فروش رفتن:** فرۆشیان؛ فرۆشران؛ وەرشیەی؛ وەرشیای ‹همەی کتابها فروش رفت: کتێبەکان هەموو فرۆشران›.

**فروش کردن:** فرۆش‌کردن ‹امروز فروش خوبی کردیم: ئەورۆ فرۆشێکی باشمان کرد›.

**به فروش رساندن:** فرۆشتن ‹هر چه داشت به فروش رساند: ئەوەی هەبووی، فرۆشتی›.

**به فروش رسیدن:** فرۆشران ‹این خانه به فروش می‌رسد: ئەم خانووە دەفرۆشرێ›.

**ـ فروش**[2]: پیوازە. ـ فرۆش؛ ـ فرووش؛ ـ وەرش؛ فرۆشەر ‹پارچەفروش: پارچەفرۆش›.

**فروشدن** / furûšodan/ ☜ **فرو ـ**

**فروشست** / furûšost، ـها/: اسم. [زمین‌شناسی] کار و ڕەوتی تێڕۆچوون؛ شۆڕیانەوە و ژێر خاک چوونی خوێ و ماکە ئالیەکان بە هۆی ئاو و بارانی سەر زەویەوە.

**فروشگاه** / furûšgāh, forûšgāh، ـها/: اسم. فرۆشگە؛ موغازە؛ دووکان ‹فروشگاه لوازم خانگی: فرۆشگەی کەل‌وپەلی ناوماڵ›.

**فروشندگی** / furûšandegî, forûšandegî/: اسم. فرۆشیاری: ۱. کار و ڕەوتی فرۆشتن ۲. پیشەی فرۆشیار.

**فروشنده** / furûšande, forûšande، ـها؛ ـگان/: اسم. فرۆشیار؛ فرۆشەر؛ فرۆتۆخ: ۱. کەسێ کە لە فرۆشگەدا شت‌ومەک دەفرۆشێ ۲. کەسێ کە شتێک دەفرۆشێ. بەرانبەر: **خریدار**

**فروشی**[1] / furûšî, forûšî، ـها/: صفت. فرۆشی؛ وەرشی؛ فرووشی؛ بۆ فرۆش دانراو ‹خانەی فروشی: ماڵی فرۆشی›.

**ـ فروشی**[2]: پیوازە. ـفرۆشی؛ ـوەرشی؛ ـفرووشی: ۱. کاری فرۆتن ‹کم‌فروشی: کەم‌فرۆشی› ۲. فرۆشگە ‹طلافروشی: زێڕفرۆشی›.

**فروع** / furû', forû'/: [عربی] جمعِ ☜ **فرع**

**فروغ** / furûq, forûq/: اسم. [ادبی] ڕووناکی؛ ڕۆناهی؛ گەشاتی؛ نوور؛ ڕۆشنایی؛ دروشم ‹فروغ آفتاب: ڕووناکی هەتاو›.

**فروکتوز** / f(e)rûktoz/: [فرانسوی] اسم. [شیمی] فروکتۆز؛ قەندی میوە؛ هیدراتی کەربونی هەنگوین و میوەگەلی شیرین (وەک ترێ و هەنجیر) کە ماکێکی بێ‌ڕەنگە و دوو ئەوەندەی قەند شیرینە: **لوولز**

**فروکردن** / furûkardan/ ☜ **فرو ـ**

**فروکش** / furûkeš/: اسم. بنیش؛ کار و ڕەوتی داتەمریان؛ دامرکیان؛ نیشتنەوە؛ دامرکان؛ کەم بوونەوەی هێز و گوڕی شتێک ‹سیل فروکش کرد: لافاو بنیشی کرد›. هەروەها: **فروکش کردن**

**فروکشند** / furûkešand، ـها/: اسم. خوارترین ڕادەی داکشانی توێکڵی زەوی، ڕووبەری ئاو و کەش بە هۆی هێزی ڕاکێشی مانگ و خۆرەوە. بەرانبەر: **فراکشند**

**فروگذار** / furûgozār/: اسم. درێخی؛ درێغ؛ کار یان ڕەوتی لە جێ هێشتن؛ دەس لێ بەردان؛ کەم دانان؛ کۆتایی‌کردن؛ نیوەکارە داخستن؛ بەجێ هێشتنی کار و دەس لێ بەردانی ‹آرام از هیچ تلاشی در این راه فروگذار نکرد: ئارام لە هیچ هەوڵێک لەم ڕێگایەدا درێخی نەکرد›.

**فروگذاشتن** / furûgozāštan/ ☜ **فرو ـ**

**فروماندن** / furûmāndan/ ☜ **فرو ـ**

**فرومایگی** / furûmāyegî ، ـها/:اسم. پەستی؛ ناکەسی؛ سەرشکەستی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی هیچ و پووچ بوون.

**فرومایە** / furûmāye ، ـها؛ ـگان/: صفت. پەست؛ ناکەس؛ سەرشکەست؛ تەرەس؛ هۆڤەبەر؛ سووک؛ بە ئاکار و کردەوەی سووک و دزێو و کەمتەرخەم لە ئاست مرۆڤایەتیەوە.

**فروند** / farvand/:اسم. یەکەی ژماردنی گەمیە، فرۆکە و ژێر دەریایی و مووشەک.

**فرونشاندن** / furûnešāndan/ ☜ **فرو-**

**فرونشستن** / furûnešastan/ ☜ **فرو-**

**فرویدیسم** / f(e)roydîsm/:اسم. فرۆیدیسم؛ ڕێبازێکی دەروونناسی کە لە لایەن بزیشکی بەناوبانگی ئوتریشی، زیگموند فرۆیدوە (١٨٥٦-١٩٣٩ ز.) دامەزرا.

**فره** / farre/:اسم.[ادبی] فەڕ؛ شکۆ؛ مەزناهی.

**فرهنگ** / farhang ، ـها/:اسم. فەرهەنگ: ١. ڕست؛ هۆرتە و بەرە؛ دیاردەیەکی کۆمەلایەتی لە داب و نەریت، بیر و بۆچوون، هونەر و لێهاتوویی و شێوازی ژیان کە لە درێژەی ئەزموونی مێژوویی گەلاندا ڕەنگ دەگرێ و بۆ بەرەی داهاتوو دەمێنێتەوە ٢. وشەنامە؛ کتێبێک کە وشە و دەستەواژەی زمانێکی تێدا ڕیز کراوە و شێوەی خوێندنەوە و ڕەگەز و باری ڕێزمانی و ... هەرکامی ڕوون کراوەتەوە و هەر بەو زمانە یان بە زمانێکی تر مانای لێدراوەتەوە ٣.[گفتاری] سەرجەمێک زانیاری لە مەڕ هونەر، وێژە، زانست، سیاست و...وە کە کەسێک بۆ گەشە دان بە هزر و لێهاتوویی خۆی فێری دەبێ ٤.[گفتاری] چاند؛ ئاکاری شیاو و گونجاو بەپێی داب و نەریتی کۆمەلگا ٥.[مجازی] نەریتی کۆمەلگایی.

◘ **فرهنگ مردم**: کەلەپوور؛ کولتوور؛ فەرهەنگی گەل: ١. سەرجەمی داب و نەریت، چیرۆک، مەتەل، ڕست و خووی هۆزێک ٢. لقێک لە زانست کە لەم بابەتەوە دەکۆلێتەوە.

**فرهنگ‌آموزی** / farhangāmûzî/ ☜ **فرهنگ‌پذیری**

**فرهنگ‌پذیری** / farhangpazîrî ، ـها/:اسم. ١. ڕەوتی پێک‌گۆڕینەوەی داب و نەریتی نێوان هۆز و گەلانی جۆراوجۆر کە دەبێتە هۆی داهاتنی شێوەگەلی نوێ ٢. ڕەوتێ کە دە منالیەوە دەست پێ‌دەکا و هۆی فێر بوون و گۆڕانکاری بیر و ڕا و کەسایەتیە ✽ **فرهنگ‌آموزی**

**فرهنگ‌زدایی** / farhangzedayî ، ـها/:اسم. ڕەوتی لە نێو بردنی بایەخ و دەسکەوتی فەرهەنگی هۆزێک.

**فرهنگستان** / farhangestān ، ـها/:اسم. کۆڕی زانیاری؛ چاندگە؛ کۆزمان؛ کۆڕێ لە زانیاران، وێژەوانان یان هونەرمەندانی ولاتێک، بۆ پەرە پێدانی زانست، وێژە یان هونەری ئەو ولاتە. هەروەها: **فرهنگستان ادبیات؛ فرهنگستان زبان؛ فرهنگستان علوم**

**فرهنگ‌ستیزی** / farhangsetîzî ، ـها/:اسم. شەڕ و بەربەرەکانێ لەگەل چالاکی و بەرهەمی فەرهەنگی میللەتێکدا. هەروەها: **فرهنگ‌ستیز**

**فرهنگ‌سرا** / farhangsarā ، ـها/:اسم. یانەی فەرهەنگ؛ دامەزراوەیەک بۆ چالاکی فەرهەنگی.

**فرهنگنامە** / farhangnāme ، ـها/:اسم. فەرهەنگنامە؛فەرهەنگی‌بەرفراوان: ١. فەرهەنگی زانستی؛ ئینسایکلۆپیدیا ٢. فەرهەنگێک بریتی لە واتای وشە و ناساندی ناونامە.

**فرهنگ‌نویس** / farhangnevîs ، ـها؛ ـان/:اسم. فەرهەنگ‌نووس؛ فەرهەنگ‌نڤیس؛ نووسەر، کۆکەر و بەدیهێنەری فەرهەنگ.

**فرهنگ‌نویسی** / farhangnevîsî/:اسم. فەرهەنگ‌نووسی؛ فەرهەنگ‌نڤیسی؛ لقێک لە زانستی وێژەوانی کە بە کۆکردنەوە، تۆژینەوە، پۆلێن و واتانووسینی وشەی زمانێک یان لقێکی

زانستیەوە خەریک دەبێ.

**فرهنگی** / farhangî ، ـها؛ ـان/: *صفت*. فەرهەنگی: ۱. کاری فەرهەنگی ‹فعالیت فرهنگی: چالاکی فەرهەنگی› ۲. ئەندامی وەزارەتی پەروەردە ‹شوهرش فرهنگی است: مێردەکەی فەرهەنگیە›.

**فرهیختگی** / farhîxtegî ، ـها/: *اسم*. ژیری؛ ئاوەزمەندی؛ فرەزانی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بە فەرهەنگ بوون.

**فرهیختن** / farhîxtan/: *مصدر. متعدی. [قدیمی]* ژیرکردن/ کەردەی؛ کردنە خاوەن فام و فەرهەنگ.

**فرهیخته** / farhîxte ، ـگان/: *صفت*. تێگەیشتوو؛ خاوەن فەرهەنگ.

**فریاد** / faryād ، ـها/: *اسم*. هاوار؛ هەوار؛ قوو؛ قاو؛ فەریا؛ فریا؛ فریاد؛ قوولە؛ هنا؛ هاوار و دا؛ وەیل؛ قولا؛ هەرا؛ داد؛ داو؛ گاز-گاز: ۱. دەنگێکی بەرز کە لە گەرووی گیاندارێکەوە دەردێ ‹فریاد فروشندەی دورەگرد را می‌شنید: هاواری وردەوالە فرۆشەکەی دەبیست› ۲. زیرە؛ گالە؛ زریکە؛ ئەنین؛ دەنگی دەربڕینی ژان و خەفەت ‹فریاد مردم از دست ماموران بلند شد: زیرەی خەلک لە دەستی ژاندارمەکانەوە هەستا›.

▣ **فریاد زدن**: هاوار/ هەوارکردن؛ گالە و نالە کردن؛ قوولاندن؛ ویلان؛ هەرا کردن؛ قولانن؛ قیڕاندن؛ گالین؛ زارین؛ قیڕنەی؛ قیڕنای؛ قیڕەکردن؛ بانگ هەلێنان؛ هاوارێ کەردەی؛ بە دەنگی زۆر بلندەوە قسە کردن ‹من کر که نیستم چرا فریاد می‌زنی؟: خۆ من کەڕ نیم بۆچی هاوار دەکەی؟›. هەروەها: **فریاد کشیدن**

**به فریاد کسی رسیدن**: فریای کەسێ کەوتن؛ بە هانای کەسێکدا چوون؛ گەینە داو کەسێکا؛ یاوای دادوو یۆیرە ‹اگر به فریادش نرسیده بودند خفه می‌شد: ئەگەر فریای نەکەوتبان دەخنکا›.

**فریادرس** / faryādres ، ـها؛ ـان/: *اسم*. ۱. فریاڕەس؛ ئەوەی دەگاتە فریای هاوارکەرەوە ۲. دادڕەس؛ کەسێ کە بە شکات و سکالای خەلک ڕادەگا.

**فریب** / farîb ، ـها/: *اسم*. فریو؛ گزی؛ فێل؛ گۆل؛ گول؛ گوول؛ لابان؛ خاپ؛ لیپ؛ لیت؛ لەپۆک؛ تیزتەلەکە؛ گرو؛ گر؛ لاس؛ ئوین؛ هەپە؛ ئاوانتە؛ پەنگ: ۱. درۆ یان ناڕاستێ کە بە جێی ڕاست نیشان بدرێ یان بگوترێ ۲. کاری خلەتاندنی کەسێک بۆ ئەوەی درۆ بە ڕاست بناسێ.

▣ **فریب خوردن**: فریو خواردن؛ خلەتان؛ خەلەتان؛ هەلخەلەتان؛ هەلفریوان؛ خلافان؛ خلەفان؛ خەلەفان؛ خاپان؛ خاپیان؛ خاپین؛ غەرین؛ لێپخارن؛ گول واردەی؛ خەلەتیەی؛ خلەتیای؛ تەفرە خواردن؛ دەسخەڕۆ بوون؛ بەفریو چوون؛ لەخشتە چوون؛ فریبیان؛ هەربلین ‹گمان نمی‌کرد از یک بچه فریب بخورد: پێی وا نەبوو فریوی مندالێک بخوا›.

**فریب دادن**: خەلەتاندن؛ خلەتانن؛ هەلخلەتاندن؛ خەلەتنەی؛ خەلەتنای؛ لاسدان؛ گول دەی؛ فریو/ فریب دان؛ خلەتنان؛ هەلفریواندن؛ هەلفریوانن؛ هەلخەلەتانن؛ تەفرەدان؛ گوول داین؛ غافلاندن؛ غەلەتنەی؛ غەلەتنای؛ لاباندن؛ خاپاندن؛ نال کردن؛ هەربلاندن؛ هەپەنان؛ غەڕاندن؛ بەسەردا برن؛ لاڕێ کردن؛ بە هەلە بردن؛ لە خشتە بردن ‹یک بچه هم تو را فریب داد: مندالێک خەلەتاندتی›.

**فریب کسی/ چیزی را خوردن**: کلاو شتێ یان کەسێ چوونە سەر؛ فریوی کەسێ/ شتێ خواردن؛ گولوو یۆی/ چێوێوی واردەی ‹من فریب کارهایش را خوردم: من کلاوی کارەکانی چووە سەرم›.

**فریبا** / farîbā/: *صفت*. ۱. خاپینۆک؛ هۆی فریو خواردن ۲. *[مجازی]* خومخوم؛ شەنگ و شۆخ؛ زۆر جوان و دلگر.

**فریبکار** / farîbkār ، ـها؛ ـان/: *صفت*. فریودەر؛

هەڵخەڵەتێن؛ خاپینۆک؛ مەلاق؛ خاپۆک؛ خاپۆ؛ فریوباز؛ لە خشتەبەر؛ قۆڵشکێن؛ کەلاجۆیە؛ زۆر دەسبڕ و بە فریو.

**فریبکاری** / farîbkārî ، ـها/: *اسم.* خاپینۆکی؛ فریوکاری؛ کار یان ڕەوتی خڵەتاندن.

**فریبندگی** / farîbandegî/: *اسم.* خاپێنەری؛ فریودەری.

**فریبنده** / farîbande/: *صفت.* خاپێنەر؛ فریودەر؛ خاوەن ڕواڵەتی هەڵخڵەتێن.

**فریزر** / firîzer, f(e)rizer ، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* فریزر؛ قەرسینک؛ بەفریک؛ کەرەستەیەکی ڕچێنەری کارەبایی وەک یەخچاڵ، کە ماکی خۆراکی (زۆرتر گۆشت) دەڕچێنێ و ڕایدەگرێ.

**فریس** / farîs /: *اسم.* فرس؛ فریزوو؛ فرێزوو؛ فرێز؛ فرووزوو؛ فرووزی؛ هەرێز؛ گیای چیمەن کە بژارێکی زۆر دژوارە.

**فریضه** / farîze ، ـها؛ فرایض/: [عربی]/*اسم.* ئەرکی سەرشان؛ کارێ کە لە سەر مرۆڤە.

**فریفتن** / farîftan/: *مصدر. متعدی. لازم.* // **فریفتی:** خاپاندت؛ **می‌فریبی:** دەخاپێنی؛ **بفریب:** بخاپێنە// □ *متعدی.* ۱. خاپاندن؛ فریو دان؛ خڵەتاندن؛ گوڵ دەی؛ خڵەتنان؛ فێرانن؛ تەفرەدان؛ هەپەنان؛ هەربلاندن؛ خەڵەتنەی؛ غەڵەتنای؛ خڵەتنای؛ لە خشتە بردن؛ گوڵ دان؛ لابادن؛ خەڵەتاندن؛ درۆ و ناڕاست لە جیاتی ڕاست بە خەڵک نیشان دان ۲. *[مجازی]* هۆگر کردن؛ دڵ بردن؛ بە کردەوە، جوانی یا لێهاتوویی، کەسێک بۆ لای خۆ ڕاکێشان □ *لازم.* ۳. *[قدیمی]* خاپان؛ خاوان؛ خەڵەتان؛ خڵەتان؛ خەڵەتیەی؛ غەڵەتیای؛ خڵەتیای؛ گوڵ واردەی؛ لە خشتە چوون.

■ **صفت فاعلی: فریبنده** (خاپێنەر)/ **صفت مفعولی: فریفته** (خاپێنراو)/ **مصدر منفی: نفریفتن** (نەخاپاندن)

**ـ فزا** / fazā/: *پیوازه. [مخفف]* ـگەشێن؛ ـ ئەفزا؛ ـهەڤوورێن؛ هەڤیاز ‹جانفزا: گیان گەشێن›.

**فزاینده** / fazāyande/: *صفت. [ادبی]* لە زێدە؛ بە لێهاتوویی یان تایبەتمەندی فرەوە بوون ‹نیروی فزاینده: هێزی لە زێدە›.

**فزرتی** / fezertî/ ☜ **زپرتی**

**فزع** / faza' ، ـها/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* ناڵە و زاری؛ ناڵان و گریان؛ کاز- کاز؛ شین؛ شەپۆڕ؛ گریان و شین؛ شین و هاوار.

**فزودن** / fozûdan/: *مصدر. متعدی. [مخفف]* هەڤووراندن؛ زیاد/ فرەکردن.

**فزون** / fozûn, fuzûn/: *قید. [مخفف]* پتر؛ فرەتر؛ زۆرتر؛ زیاتر؛ زیادتر؛ زیاتەر.

**فزونخواهی** / -fozûnxāhî, fuzûn ، ـها/: *صفت.* زیادەخوازی؛ فرەخوازی؛ فرەوازی.

**فزونی** / fozûnî, fuzûnî ، ـها/: *اسم.* زۆری؛ فرەیی؛ فراوانی؛ فرەبوونی؛ زۆربوونی؛ زیادی؛ هەڤیازی؛ ڕەوتی زۆر بوونەوە و ڕوو لە فرەیی نان.

**فس** / fes(s)/: *صوت.* فس؛ دەنگی دەرچوونی با لە کونێکەوە ‹تا آمدم سوار دوچرخه شوم فس، باد لاستیکش در رفت: تا هاتم سواری دووچەرخە بم فس، بای لاستیکەکەی دەرچوو›.

**فساد** / fasād, fesād ، ـها/: [عربی]/*اسم.* گەندەڵی: ۱. کرمۆڵی؛ خراپی ‹مواد قندی باعث فساد دندانها می‌شود: ماکی قەندی دەبێتە هۆی کرمۆڵی ددان› ۲. فەت؛ خراوکاری؛ کار یان ڕەوتی کەرخاندن ‹فساد اقتصادی: گەندەڵی ئابووری›.

**فسانه** / fasāne, fesāne ، ـها/: *اسم. [مخفف]* ئەفسانە؛ دیرۆک؛ چیڤانۆک.

**فستیوال** / festîvāl ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* میهرەگان؛ ئاهەنگ؛ فیستیڤاڵ.

**فسخ** / fasx/: [عربی]/*اسم.* کار یان ڕەوتی هەڵوەشاندنەوە؛ پووچەڵکردنەوە. هەروەها: **فسخ شدن؛ فسخ کردن**

**فسرده** / fesorde/: *[مخفف]* ☜ **افسرده**

**فسفات** / fosfāt ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم. [شیمی]*

فوسفات؛ هەر کام لە خوێکانی ئەسید فوسفوریک کە پتر وەک کووت بە کار دەچن.
**فسفر** / fosfor/: [فرانسوی]/اسم. فوسفوڕ؛ توخمی کیمیایی ناکانزا بە ژمارەی ئەتۆمی ١٥ و کێشی ئەتومی ٣٠,٩٧، کە لە بەرهەمهێنانی ئالیاژ و شەمچە و کووتدا بەکاردێت. بێجگە فوسفوڕی ئاسایی، فوسفوڕی سپی و سوور و زەرد و بنەوشیش هەیە.
**فسفر تابی** / fosfortābî/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. فوسفورتاو؛ فوسفورسانس.
**فسفرسانس** / fosforsāns/: [فرانسوی]/اسم. فوسفورتاو؛ فوسفورسانس: ١. *[شیمی]* سۆسەتیشکێکی سەوز کە لە ئوکسیدە بوونی ئارامی فوسفوری سپی لە هەوادا بەدی دێ ٢. *[فیزیک]* تیشکدانەوەی لە پەستای ماکێک پاش ئەوەی وەبەر گەرما، تیشک یان کارەبا بخرێ ٣. *[جانورشناسی]* ڕەوت یان دۆخی بەدیهێنانی تیشک لە لایەن ژینەوەرێکەوە (وەک گولەستێرە).
**فس‌ـفس** / fesfes/: صوت. ١. هنەهن؛ مشەمش؛ مووشەمووش؛ دەنگی هەناسە کێشان لە کاتی گیرانی لووتدا.
▣ **فس ـ فس کردن**: *[کنایی]* فسەفس‌کردن؛ خاوەخاوکردن؛ سنەسن‌کردن؛ بە خاوی و شێنەیی کارکردن.
**فسفین** / fosfîn/: [فرانسوی]/اسم. *[شیمی]* فوسفین؛ گازی بێ‌ڕەنگ و ژاراوی فوسفور بە بۆنێکی تایبەتەوە کە بۆ قانگدانی دەخڵ و دانی نێو هەمار بە کەڵک دێت.
**فسق** / fesq ، ـها/: [عربی]/اسم. گەناوەری؛ گەندەڵەکاری؛ خراپەکاری؛ کارێ کە کردنی حەرامە، بەتایبەت زینا.
**فسقلی** / fesqelî ، ـها/: [از کردی] صفت. *[تعریض، گفتاری]* فیسقەلی؛ فیسقلی؛ تیسقل؛ تسقەلی؛ زۆر بچووک ‹بچه فسقلی: منداڵی فیسقەلی›.
**فسق و فجور** / fesq-o-fucûr, -focûr ، ـها/:/اسم. خراپەکاری؛ گەندەڵکاری؛ نابەکاری؛ کاری تاوان و حەرام بە تایبەتی عەیش و نۆش و ڕابواردن.
**فسن** / fesen، ـها/:/اسم. سان؛ بەردەسان؛ کوچکەسان؛ هەسان؛ بەردەساو؛ جۆرێک بەردی سیلیسی کە بۆ ساو کردنی بەرد و کانزا و تیژ کردنی کارد و چەقۆ بەکاری دێنن.
**فسنجان** / fesencān/:/اسم. فسنجان؛ جۆرێک خۆرشت کە بە گۆشت، هاڕاوی گوێز، ڕوبەهەنار و تامەچێشتی‌تر لێ‌دەنرێ.
**فسون** / fusûn, fosûn/: *[مخفف]* ☜ **افسون**
**فسونگر** / fusûngar, fosûngar ، ـها؛ ـان/:/اسم. *[مخفف]* سێحرباز؛ سێحربەند؛ ئەفسوونکار.
**فسیل** / fosîl ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. فوسیل؛ بەردینە؛ قاپلۆخەی وەک بەرد هەڵاتووی لەش یان پاشماوەی گیانەوەری زۆر کۆن کە لە نێو زەویدا وەک خۆی ماوەتەوە.
**فش** / feš/: صوت. فیچق؛ فشقە؛ فیشقە؛ دەنگی هاتنە دەری ئاو یان هەڵم لە کونێکەوە (وەک لوولە یان شێری ئاو) ‹تا شیر آب را باز کردم، آب فش پاشید به سر و صورتم: تا شێرەکەم باز کرد ئاو فیچق پرژا بە سەر و چاومدا›.
**فشار** / fešār ، ـها/:/اسم. تەوژم؛ تەوشم؛ گوشار؛ وشار؛ خوشار؛ گوش؛ گوڤاش؛ گەرمش؛ زیپ: ١. نهێم؛ لێش؛ هێزێ کە بە کەرەستەیەکەوە دەخرێتە سەر شتێک ‹فشار انگشت: تەوژمی قامک› ٢. هەممەت؛ کاردانەوەی هێزێک بە سەر شتێکدا ٣. زۆر؛ ئازار و گرانی ڕەنجی زەینی یان لەشی ‹فشار گرسنگی: زۆری برسیەتی› ٤. *[سیاست]* کار و ڕەوتی زۆر هێنان و تەنگ پێ‌هەڵچنین لە لایەن دەوڵەتەوە بەسەر ڕخنەگران و نەیاراندا ‹فشار بر مطبوعات: زۆر هێنان بۆ چاپەمەنیەکان›.
▣ **فشار جَوّ**: گوشاری کەش؛ تەوژمێ کە کەشی زەوین دەیخاتە سەر ئەو شتانەی لە نێویدان.
**فشار خون**: تەوژمی خوێن؛ گوشاری خوێن:

١. گوشاریَ کە خوێن دەیخاتە سەر دیوارەی ڕەگەکانەوە ٢. دۆخێکی نەخۆشی کە بە هۆی نالەباری کاری دڵ، ڕەقی سوورەڕەگەکان، بەرگری مووڕەگەکان لە ئاست گەڕانی خوێن و ڕیژە و خەستی خوێنەوە بەدی دێت.

**فشار روانی:** گوشاری دەروونی؛ تەوژمی ڕەوانی؛ گوشارێکی زۆر کە دەبێتە هۆی بەدیهاتنی ترس، دڵەڕاوکێ، زیچ و هەڵچوونی دڵۆڤانی و ئازاری دیکەی دەروونی.

▣ **فشار آوردن:** زۆر هێنان؛ سەر داگرتن؛ گەرمشاندن؛ تەوژم هێنان: ١. گوشار بۆ هێنان ‹آب فشار آورد و پل را خراب کرد: ئاو گوشاری هینا و پردەکەی ڕووخاند› ٢. تەنگ لێهەڵچنین؛ تەنگ پێهەڵچنین؛ هەراس پێهەڵگرتن ‹به همسرش فشار می‌آورد که ماشین بخرد: زوری بۆ مێردەکەی دەهینا ماشین بکڕێ›.

هەروەها: **فشار وارد کردن؛ زیر فشار گذاشتن**

**فشار دادن:** گووشان؛ گووشین؛ گڤاشتن؛ گوشین؛ کوشین؛ گلۆڤین؛ هەڵگووشین؛ گوشار دان؛ تەوژم دان؛ هەڵپشافتن؛ هەڵپشاوتن؛ شوارەی؛ شوارای ‹فشار بده آبش درمی‌آید: بیگووشە ئاوەکەی دەردێ›.

**فشار وارد کردن** ☜ **فشار آوردن**

**زیر فشار گذاشتن** ☜ **فشار آوردن**

**فشارسنج** / fešārsanc ، هـا/: اسم. تەوژمپێو؛ گوشارپێو؛ بارومیتر؛ کەرەستەیەک بۆ پێوانی تەوژمی کەش.

**فشارنگار** / fešārnegār ، هـا/: اسم. [هواشناسی] باروگراف؛ کەرەستەیەک بۆ کێشانی گۆڕانکاری تەوژمی کەش لە ماوەیەکی دیاریکراودا.

**فشاری** / fešārî/: صفت. ١. گوشاری ‹شیر فشاری: شێری گوشاری› ٢. گووشاو؛ گووشراو؛ گووشیاگ ‹آجر فشاری: خشتی گووشاو›.

ـــ **فشان** / fešān/: پیوازه. ١. ـــ پژێن؛ پژێنەر ‹آتش‌فشان: ئاگرپژێن› ٢. ـــ باز؛ بەختکەر ‹جان‌فشان: گیانباز›.

**فشاندن** / fešāndan/: [مخفف] ☜ **افشاندن**

**فشانیدن** / fešānîdan/: [مخفف] ☜ **افشاندن**

**فشردگی** / fešordegî ، هـا/: اسم. گولۆفی؛ گوفاش؛ کوشراوی؛ میچڕاوی؛ گووشراوی؛ گووشیاگی.

**فشردن** / fešordan/: مصدر متعدی. // **فشردی:** گووشیت؛ **می فشاری:** دەگووشی؛ **بفشار:** بگووشە// گووشین؛ گوشین؛ گوشان؛ گوشانن؛ کوشین؛ هەڵگوشان؛ هەڵگوشین؛ هەڵپشافتن؛ پواندن؛ گواشن؛ گواشتن؛ گڤاشتن؛ وستمین؛ گلۆڤین؛ هەڵگلۆڤان؛ هەڵگلۆڤتن؛ هەڵگلۆڤین؛ هەڵکوشین؛ تەوژمدان؛ حەشکاندن؛ وشین؛ ڕێکگوشین؛ هەڵپشتافتن؛ پشافتن؛ هەڵپشاوتن؛ گوفاشتن؛ شوارەی؛ شوارای؛ شوارتەی؛ تەژاندن؛ تێکهەڵگوشین؛ وشاردن؛ پشاوتن؛ گوڤشاندن؛ پەساندن؛ بە هێزی میکانیکی بە ڕووبەری دەرەکی شتێ گوشار هێنان. هەروەها: **فشردنی**

■ **صفت فاعلی: فشارنده** (گووشەر)/ **صفت مفعولی: فشرده** (گووشراو)/**مصدر منفی: نفشردن:**(نەگووشین)

**فشرده**[1] / fešorde/: صفت. ١. تۆکمە؛ گووشراو؛ کوشراو؛ وشاو؛ گلۆفیاگ؛ گوڤاشتی؛ گران؛ توند و پڕ ‹جسم فشرده: شتی تۆکمە› ٢. کورت؛ کورتەوەکراو ‹گفتار فشرده: کورتە وتار›.

**فشرده**[2]: قید. بەکورتی؛ هەڵگوش؛ هەڵکوش ‹خیلی فشرده نوشته شده بود: زۆر بە کورتی نووسرابوو›.

**فشفشه** / fešfeše ، هـا/: اسم. فیشەکەشێتە؛ فشفشە؛ تۆق‌تۆقە؛ هاژەک؛ وژەک؛ مەشەک ئەو تەقەمەنیە منداڵ لە جێژنا دەیتەقێننەوە.

**فشنگ** / fešang ، هـا/: اسم. فیشەک؛ فشەک؛ فیشەنگ؛ بەر؛ شەنگ؛ قالک؛ لوولەیەکی گچکە داگری باروت و گوللە و تەڕیقە.

**فشنگی**[1] / fešangî/: صفت. فیشەکی؛ وەکوو

فیشەک ‹قلم فشنگی: قەڵەمی فیشەکی›.
**فشنگی** [2]: *قید. [گفتاری]* گورج؛ خێرا؛ تونـد و تیـژ؛ وەکوو فیشەک ‹فشنگی برو!: گورج بچۆ!›.
**فصاحت** / fesāhat, fasāhat/: [عربی]/*اسم.* دەمپاراوی؛ قسەڕەوانی؛ خرۆبێژی؛ سفک‌زمانی؛ ڕەوانبێژی؛ وتەپاراوی؛ زمان پاراوی؛ قسەپاراوی؛ گوتاری ڕەوان و ورد و جوان.
**فصح** / fasah/: [معرب از عبری]/*اسم.* فەسەح؛ جێژنی فەتیر؛ جێژنێکی گرینگی جووە کە لە شەوی چواردەی مانگی نیسانەوە دەس پێدەکا و بە ماوەی حەوتەیەکە.
**فصحا** / fosahā/: [عربی] جمعِ ☜ **فصیح**
**فصد** / fasd/: [عربی]/*اسم.* حیجامەت؛ کاری دەمار لێدان بۆ هاتنە دەرەوەی خوێن؛ کەڵەشاخ لێ نان.
**فصل** / fasl ، ـها؛ فصول/: [عربی]/*اسم.* ١. وەرز؛ کەژ؛ کەژە؛ کەش؛ کژ؛ پشکساڵ؛ گۆنەر؛ گۆنەڵ؛ هەڤرۆنگ؛ فەسڵ؛ کژەساڵ؛ بەشێک لە چواربەشی ساڵ بە هەوای تایبەت بە خۆیەوە کە سێ مانگە ‹فصل تابستان: وەرزی هاوین› ٢. وەرز؛ سەردەم؛ هەڕەت؛ ئەنگۆرە؛ گۆنگەڵ؛ هاڤرۆنگ؛ جەنگە؛ جەرگە؛ کانگە ‹فصل انار: هەڕەتی هەنار› ٣. بەش؛ پاژ؛ بابەتێکی جیاواز لە کتێب کە لەگەڵ بابەتەکانی تردا پێوەندی هەیە ‹فصل پنجم، در عشق و جوانی: بەشی پێنجم سەبارەت بە ئەوین و جوانی› ٤. *[ادبی]* کار یان ڕەوتی یەکلا کردنەوە؛ جوێ‌کردنەوە؛ لێک‌کردنەوە؛ جیا کردنەوە ‹حل و فصل معامله: یەکلا کردنەوەی مامەڵە›.
▣ **فصل مشترک**: کەرخی هاوبەش؛ هێڵێ کە دوو ڕووبەر یان دوو شتی لە پەنا یەک لێک جیا دەکاتەوە و هەر دوو تێیدا هاوبەشن.
**فصلنامه** / faslnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* وەرزنامە؛ گۆڤارێ کە وەرزێ (سێ مانگ) جارێک دەردەچێ.
**فصلی** [1] / faslî/: [عربی] *صفت.* وەرزی ‹بیکاری فصلی: بێکاری وەرزی›.
**فصلی** [2]: *قید.* وەرزانە؛ وەرزی ‹در نشریه‌ای کە فصلی منتشر می‌شود باید پیوند مطالب حفظ گردد: لە بلاڤۆکێکدا کە وەرزانە دەردەچێ، دەبێ پێوەندی بابەتەکان بپارێزرێ›.
**فصول** / fusûl, fosûl/: [عربی] جمعِ ☜ **فصل**
**فصیح** / fasîh/: [عربی] *صفت.* ١. پاراو؛ ڕەوان ‹گفتار فصیح: وتاری پاراو› ٢. /ـها؛ فُصحا/ دەمپاراو؛ دەماوەر؛ وتەپاراو؛ قسەزان؛ زماندار؛ زمانڕەوان؛ ڕەوانبێژ؛ بەدەم و پل؛ قسەڕەوان؛ لەبلەبان؛ دەمەوەر ‹مرد فصیح: پیاوی دەمپاراو›.
**فضا** / fazā ، ـها/: [عربی]/*اسم.* بۆشایی؛ گشێوش؛ گشیوس: ١. ئاسمان؛ ناوچەی ئەو پەڕی کەش ‹در فضای لایتناهی: لە ئاسمانی بێ‌سنووردا› ٢. حەوا؛ پانەیەکی بێ‌سنووری سێ‌لا کە هەموو شتێکی تێدایە ‹فضای سەبعدی: بۆشایی سێ‌لا› ٣. ڤالایی؛ پانەیەکی بە یەک، دوو یان سێ بەرەوە (وەک مەودا، پانتایی، بارستایی) ٤. کەش؛ بار و دۆخ؛ ئاقار، بەتایبەت چۆنیەتیەکەی ‹فضای سیاسی: بار و دوخی رامیاری›.
**فضائل** / fazā'el/: [عربی] ☜ **فضایل**
**فضائی** / fazā'î/: [عربی] ☜ **فضایی**
**فضاپیما** / fazāpeymā ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ئاسمانپێو؛ ماشینێ کە بۆ ناو بۆشایی ئاسمان بڕوا.
**فضاحت** / fezāhat, fazāhat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* بێڕوومەتی؛ بێ‌ئابڕوویی؛ لەکەداری؛ فهێت؛ ئابڕووتکاوی؛ شوورەیی؛ شەرمەکاری.
**فضاسازی** / fazāsāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کەش‌سازی؛ بەرپاکانێ؛ کار و ڕەوتی ساز دانی بار و دۆخێک بۆ باش تێگەیاندنی بیسەر یان بینەر لە مەبەستی ڕەچاوکراو ‹فضاسازی داستان ضعیف است: کەش‌سازی داستانەکە لاوازە›.
**فضانورد** / fazānavard ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]

/اسم. کەشوان؛ کەشڤان؛ ئەوی بۆ ناو (بۆشایی) ئاسمان دەڕوا ‹یوری گاگارین نخستین فضانورد بود: یووری گاگارین یەکەمین کەشوان بوو›.

**فضانوردی / fazānavardî/:** [عربی/ فارسی]/اسم. کەشوانی؛ کەشڤانی: ١. کار و ڕەوتی چوون بۆ ناو بۆشایی ئاسمان ٢. کار و پیشەی کەشوان.

**فضایح / fazāyeh/:** [عربی] جمعِ ☜ **فضیحت**

**فضایل / fazāyel/:** [عربی] جمعِ ☜ **فضیلت: فضائل**

**فضایی / fazāyî/:** [عربی] صفت. ١. ئاسمانی؛ حەوایی ‹سفرهای فضایی: سەفەری ئاسمانی› ٢. سێ پاڵی؛ سێ لایی ‹شکل فضایی: شکلی سێ پالی› ❋ **فضائی**

**فضل / fazl/:** [عربی]/اسم. هەڤیازی؛ سەرتری مەعنەوی کە بە هۆی تێگەیشتوویی و زانیاریەوە بەدی دێ.

**فضلا / fozalā/:** [عربی] جمعِ ☜ **فاضل**

**فضل‌فروش / fazlfurûš** ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. خۆنوێن؛ هۆگری خۆ نواندن. هەروەها: **فضل‌فروشی**

**فضله / fazle** ، ـها؛ فُضولات/: [عربی]/اسم. ڕیخ: ١. ڕێقنە؛ ریقنە؛ چیرت؛ چیڕت؛ چۆقلی؛ جیقنە؛ ڕتیق؛ پیسی پەلەوەر ‹فضلەی کبوتر: ریقنەی کۆتر› ٢. شیاکە؛ سەنێر؛ ڕەم؛ پیسی ئاژەڵ ‹فضلەی اسب: شیاکەی ئەسپ› ٣. [نامتداول] تلتە؛ پلتە؛ تفلە؛ سپلە؛ زبڵ؛ زاڵ؛ شەغەڵ.

**فضول / fuzûl, fozûl** ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. فزوول؛ هەڵقوتێن؛ هەڵقورتێن؛ خۆتێهەڵقوتێن؛ لاپرەسەن؛ لاپرەسەنگ؛ لاپلەرسەنگ؛ لاپلار؛ لاپـواز؛ دردوک؛ دردۆک؛ لابەلا؛ لابەلایی؛ لاکوت؛ لاوەلا؛ دەم تێوەدەر؛ تیکەچن؛ دەست بشۆل؛ سەنگەڵ قۆ؛ ڕەگەڵ ـ ڕەگەڵ؛ هۆگری خۆ هەڵقوتاندنە ناو کاری وا کە فری بە سەریەوە نەبێ.

**فضولات / fuzûlāt, fozûlāt/:** [عربی] جمعِ ☜ **فُضله**

**فضولی / fuzûlî, fozûlî** ، ـها/: [عربی]/اسم. لاپرەسەنی؛ سەرەتاتکێ؛ فزوولی؛ قوتەقوت؛ کار یان ڕەوتی تێهەڵقوتان؛ خۆ تێهەڵقوتان؛ قوتان؛ هەڵقوتان؛ هەڵقورتان؛ هەڵقورتیان نایيش‌سەر؛ چول کیشان؛ خۆ خەرە ناو کارێکەوە کە فری بە سەرەوە نیە. هەروەها: **فضولی کردن**

**فضیحت / fazîhat** ، ـها؛ فضایح/: [عربی]/اسم. کلکلە؛ ڕسوایی؛ بێ‌ئابڕوویی؛ بەدناوی؛ بێ‌ڕوومەتی.

**فضیلت / fazîlat** ، ـها؛ فضایل/: [عربی]/اسم. سەرڤانی؛ هەڤیازی؛ سەرتری بەتایبەت ئەوی لە ئاوەز و زانست و تێگەیشتوویەوە سەرچاوەی گرتووە.

**فطانت / fetānat, fatānat/:** [عربی]/اسم. [ادبی] وریایی؛ هێژایی؛ زیرەکی؛ ژیرڤانی؛ هینایی.

**فطر / fetr/:** [عربی] ☜ **عید فطر، عید**

**فطرت / fetrat** ، ـها/: [عربی]/اسم. نیهاد؛ بارە؛ خۆ؛ تەبیەت؛ خێم؛ هێم؛ سرشت ‹خوش فطرت: پاک نیهاد›.

**فطری / fetrî/:** [عربی] صفت. نیهادی؛ خۆیی؛ تەبیەتی؛ خێمی؛ هێمی؛ سرشتی. بەرانبەر: **اکتسابی**

**فطریه / fetrîyye** ، ـها/: [عربی]/اسم. سەرفیترە؛ سەروترە؛ پارە یان ماڵێ کە لە ڕۆژی جێژنی ڕەمەزاندا بە هەژار و فەقیر دەدرێ.

**فطیر / fatîr** ، ـها/: [عربی]/اسم. فەتیرە؛ لۆش؛ نانێ کە هەویرترشیان لە هەویرەکەی نەدابێ یان پێش لە هەڵاتنی کرابێ.

**فعال / fa'āl** ، ـها/: [عربی] صفت. کاری؛ بەکار؛ کارا: ١. ـان/ کۆشا؛ کارکۆ؛ کۆشەر؛ تێکۆشەر؛ زۆر شوولکەر ‹دانشجوی فعال: خوێندکاری کۆشا› ٢. سەرگەرم؛ لە حالی کارکردندا ‹آن کارخانه هنوز فعال است: ئەو کارخانەیە هێشتا بەکارە›

٣. لێهاتوو؛ کارکۆ؛ کارتێکەر ‹نیروی فعال: هێزی لێهاتوو›.

**فعالانه** / fa'ālāne/: [عربی/ فارسی] *قید.* چالاکانە؛ تێکۆشەرانە؛ کارکۆیانە؛ بە چالاکیەوە ‹فعالانە برای پیشرفت کار تلاش می‌کرد: چالاکانە بۆ پێشکەوتنی کار تێدەکۆشا›.

**فعال‌ساز** / fa'ālsāz ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* *[شیمی]* چالاک‌ساز؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی خستنە کار یان زۆرکردنی ڕادەی کارکۆیی ‹مادەی فعال‌ساز: ماکی چالاک‌ساز›. هەروەها: **فعال‌سازی**

**فعالیت** / fa'ālîyyat ، ـها/: [عربی] *اسم.* چالاکی؛ کارکۆیی ١. دۆخ یان چۆنیەتی کارا بوون ‹مانع فعالیت کارخانە شد: بەر چالاکی کارخانەکەی گرت› ٢. کار و ڕەوتی پەرژان بە کارێک ‹در کار ساختمانی فعالیت دارد: لە کاری خانووبەرەدا چالاکی هەیە› ٣. شێوەیەکی تایبەت لە کار ‹فعالیت سیاسی: چالاکی ڕامیاری›. هەروەها: **فعالیت داشتن؛ فعالیت کردن**

**فعل** / fe'l ، ـها؛ افعال/: [عربی] *اسم.* کار: ١. ئیش ‹فعل حرام: کاری حەرام› ٢. *[دستور]* کردار؛ وشەیێ کە بەڕێوە چوونی کار یان بار و دۆخێک لە ڕابردوو، ئێستا یان داهاتوودا نیشان دەدا ‹فعل ماضی: کاری ڕابردوو›.

⊡ **فعل امر:** *[دستور]* کاری فەرمان.

**فعل حرام:** *[اسلام]* کاری ناڕەوا؛ کاری حەرام؛ کارێ کە دین قەدەغەی کردووە.

**فعل ساده:** کاری سادە؛ کارێ کە ڕواڵەتی یەک وشەیە.

**فعل لازم:** *[دستور]* کاری تێنەپەڕ؛ کارێ کە پێویستی بە بەرکار نیە (وەک خەوتن، هەڵاتن).

**فعل ماضی:** *[دستور]* کاری ڕابردوو.

**فعل متعدی:** *[دستور]* کاری تێپەڕ؛ کارێ کە ئاکامەکەی ڕوو لە بەرکار کات (وەک خەواندن، غارپێدان).

**فعل مجهول:** *[دستور]* کارێ کە بە کرگاری نادیار بێ (وەک نووسرا). هەروەها: **فعل معلوم**

**فعل مرکب:** *[دستور]* کاری لێکدراو؛ کارێ کە لە دوو وشە پێک‌هاتبێ (وەک بار هاوردن).

**فعل مضارع:** *[دستور]* کاری ئێستا/ ڕانەبردوو.

**فعل معین** ☞ **همکرد**

**فعل واجب:** *[اسلام]* کاری واجب؛ فەرز؛ کارێ کە بە پێی دین دەبێ بکرێ.

**فعل همکرد:** *[دستور]* کرگاری هاوکرد؛ کاری هاوکار؛ کارێ کە لە دووی ناو یان ئاوەڵناوەوە دێ و کارێکی‌تر دروست دەکا (وەک «خواردن» لە «سوێند خواردن» دا): **فعل معین**

**فعلاً** / fe'lan/: [عربی] *قید.* ١. هێشتا؛ هێشتان؛ ئێستا؛ تا ئێستا؛ تا وێستا؛ جارێ؛ جارێک؛ جارێکان؛ جارێکانێ؛ هێما؛ هەڵەی؛ هەڵای؛ هێشتەر؛ هێشتاکوو؛ هێستا؛ هێسا؛ هێژ ‹فعلا نیامدە: هێشتا نەهاتووە› ٢. جارێ؛ جارێک؛ جارێکان؛ جارێکانی؛ جارێو؛ جاریە ‹فعلا می‌خواهم بخوابم: جاری دەمەوێ بنووم› ٣. تاوێ؛ ساتێ؛ هێندێک؛ ماوەیێک ‹فعلا منتظر باش، تا برمی‌گردد: تاوێ چاوەڕوان بە، تا دێتەوە›.

**فعلاتن** / fa'alāton/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* فەعیلاتون؛ کۆڵەکەیەکی شیعری عەرووزی.

**فعلگی** / fa'legî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* *[قدیمی]* کرێکاری؛ کارگەری؛ ڕەنجبەری ‹با فعلگی روزگار می‌گذرانم: بە کرێکاری ژیان دەبەمە سەر›.

**فعل و انفعال** / fe'l-o-'enfe'āl ، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* ١. کار و کاردانەوە ‹فعل و انفعال شیمیایی: کار و کاردانەوەی کیمیاوی› ٢. *[مجازی]* ئاڵوگۆڕ؛ ئاڵ‌وگۆڕ؛ گۆڕانکاری ‹فعل و انفعال نیروهای بیگانه در مرز مشهود است: ئاڵوگۆڕی هێزی بێگانە لە سنووردا دیارە›.

**فعله** / fa'le ، ـها/: [عربی] *اسم.* *[قدیمی]* کرێکار؛ کارگەر؛ ڕەنجبەر.

**فعلی** / fe'lî/: [عربی] *صفت.* *[دستور]* ١. کاری؛

کرگاری؛ کارینە؛ سەر بە کـردار ‹ریشـەی فعلـی: ڕەگی کاری› ۲. *[دستور]* کاری؛ کرگاری؛ بـە کـار گـیراو لـە ڕسـتەدا وەکـوو کـار یـان چـاوگ ‹حالت‌های فعلی را در این جمله‌ها مشخص کنید: بـاری کرکـاری لـەم چەنـد ڕسـتەیەدا دیـاردە بکـەن› ۳. ئێسـتاکە؛ هـی ئێسـتا؛ ئەوێسـتا؛ ئێسـتایی؛ ئێستەکە ‹نشان فعلی آزاد کُجاست؟: جێگە و شوێنی ئێستاکەی ئازاد کوێیە؟›.

**فعولن** / fa'ûlon/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* فـەعوولون؛ بناغەیەکێ شیعری عەرووزی.

**فغان** / faqān ، ـها/: *اسم. [ادبی]* هـاوار؛ هـەوار؛ هەڤار؛ داد؛ داو؛ سۆژە؛ فەغو؛ گاز-گاز؛ وار؛ کاری کازتین؛ نالە و گریان بە نیشانەی سکالا لە شتێ ‹فغان از این روزگار: هاوار لەم ڕۆژگـارە›. هـەروەها: **فغان داشتن؛ فغان کردن**

**فقاهـــت** / feqāhat, faqāhat/: [عربـی]/*اسـم.* مەلایەتی؛ کار و پیشەی زانای ئایینی.

**فقد** / faqd/: [عربی] ☜ **فقدان-۱**

**فقدان** / foqdān, feqdān/: [عربی]/*اسم.* ۱. دۆخ یان چۆناوچۆنی نـەبوون ‹فقـدان دلیـل: نەبوونـی بەڵـگە› ۲. *[مجـازی]* مـەرگ؛ نـەمان ‹فقـدان اسـفانگیـز اسـتاد دانشـگاه: مـەرگی خـەماوەری مامۆستای زانستگا›.

**فقر** / faqr/: [عربی]/*اسم.* ۱. کەمایەتی؛ کەمایسی؛ کەمایەسی؛ دۆخی کەم بوونی شتێک ‹فقر آهـن در بدن موجب کم‌خونی می‌شود: کەمایـەتی ئاسـن لـە لەشـدا دەبێتـە هـۆی کـەمخـوێنی› ۲. هـەژاری؛ دەستەنگی؛ کەمدەسـتی؛ بێدەسـتی؛ نـەداری؛ دەستکورتی؛ بێ‌ماڵی؛ ژاری ‹از شدت فقر گـدایی می‌کرد: لە تاوی هەژاری سوالی دەکرد›.

**فقرا** / foqarā/: [عربی] جمعِ ☜ **فقیر**

**فقرات** / faqarāt/: [عربی] جمعِ ☜ **فقره**

**فقرزدایـــی** / faqrzedāyî, -zodāyî/: [عربـــی/ فارسی]/*اسم.* کار و ڕەوتی نەهێشـتنی هـەژاری و سڕینەوەی شوێنەوارەکانی.

**فقـره** / faqare/: [عربـی]/*اسـم.* ۱. /ـهـا؛ فَقَـرات/ *[قدیمی]* مۆرەغـە؛ مووروەغـە؛ مورەغـە؛ موغـەرە؛ مۆغەرە؛ مازە؛ مۆرتخە؛ مورتخە؛ بڕبـڕە؛ مـۆرەی پشت ۲. بابەت؛ یەکەی کار یان ڕووداوێـک ‹دو فقره جنس فرستاده شـد: دوو بابـەت جـنس نـاردرا› ۳. بەرگ؛ دانە؛ یەکەی ژمـاردنی بەڵـگە و نامـە ‹دو فقره چک بانکی: دوو بەرگ چەکی بانکی›.

**فقط** / faqat/: [عربی]*قید.* تەنیا؛ تەنها؛ بـە تـەنێ؛ بتنێ؛ بتنن؛ بەس؛ هەر؛ هـەمما؛ فەقـەت ‹فقـط یک بار به خانەی ما آمـد: تـەنیا جارێـک هاتـە مالـی ئێمە›.

**فقـه** / feqh/: [عربـی]/*اسـم.* قـانوونی شـەرع؛ سەرجەمی زانیـاری سـەبارەت بـە چۆنـاوچۆنی بەڕێوە بردنی کار و باری ژیان بە پێی ئـامۆژەی دینی.

**فقها** / foqahā/: [عربی] جمعِ ☜ **فقیه**

**فقه‌اللغه** / feqholloqe/: [عربی] ☜ **فیلولژی**

**فقیـد** / faqîd/: [عربـی] *صفت.* خوالـێخۆشـبوو؛ خواعـەفووکردوو؛ نـەماو؛ کـۆچ کـردوو؛ لـەدەس چـووگ؛ مـردوو ‹همسـر فقیـد ایشـان: هاوسـەری خوالێخوشبوویان›.

**فقیر**[1] / faqîr ، ـها؛ ـان؛ فقرا/: [عربی] *صفت.* هـەژار؛ ژار؛ بەلەنگاز؛ لات؛ فەقیر؛ قیتەل؛ نەدار؛ نەخرێ؛ خـزان؛ خێـزان؛ دەسـتەنگ؛ دەسـتتـەنگ؛ دەستـەنک؛ دەسـتتـەنک؛ کـەمدەسـت؛ دەستهیشک؛ بێ‌ماڵ؛ بـێتـووک؛ بـێدەسـت؛ بێ‌سامان؛ بێ‌توک؛ برێتی لە نەدار و نـزار؛ ڕووت و ڕەجاڵ ‹کشور فقیر: ولاتی هەژار›.

**فقیر**[2]: *صفت. [ادبی]* ئەمن؛ من ‹آن مـرد بزرگـوار بـە فقیـر عنایـت داشـت: ئـەو پیـاوە گـەورە ئەمنـی دەحاواندەوە›.

**فقیرانــه**[1] / faqîrāne/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت.* هەژارانە ‹زندگی فقیرانه: ژیانی هەژارانە›.

**فقیرانه**[2]: *قید.* هەژارانە؛ دەستەنگانە؛ بـە هـەژاری ‹در آن خرابەی فقیرانه زندگی می‌کردند: لەو کـەلاوەدا

هەژارانە دەژیان›.

**فقیه** / faqîh ، ـان؛ فُقَها/: [عربی]/اسم. مەلا؛ شارەزای فیقهـ .

**فک** / fak(k)/: [عربی]/اسم. ۱. /ـ ها/ شەویلکە؛ شەویلاکە؛ شەویلاک؛ شەویلە؛ شەویلەکە؛ شەوی؛ هەر کام لە دوو پێشەی بان و خواری دەم ۲. /ـها/ دەم؛ دەمە؛ دەمی ئەو کەرستانە کە (وەک هاچەر) دەکرێنەوە و دەبەسرێن ۳. کار و ڕەوتی بەردان؛ جویَ‌کردنەوە؛ لێک‌کردنەوە ‹فک رَهْن: بەردان لە گرێو›.

◘ **فک اسفل:** آروارەی زیرین ☜ **آروارە**

**فک اعلی:** آروارەی زبرین ☜ **آروارە**

**فک رَهْن:** [حقوق] بەردان لە گرێو؛ هەڵوەشاندنەوەی پێش بڕیاری ڕەهن و ئازاد کردنی ئەوەی لە گرێودایە.

**فک** / fok ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. فوک؛ گیانەوەرێکی گوانداری ئاوژیە بە لەشی گەورەی نەرم و گوشتن، دەست و پیَ وەک باڵی ماسی و مووی زبر و کورتەوە: **سیل**

**فکاهی**/ fokāhî ،ـها؛ ـات/: [عربی] صفت. حەنەکی؛ هەنەکی؛ تیزانە؛ گەپجاڕانە، بەتایبەت سەبارەت بە وتار و نووسراوە ‹مجلەی فکاهی: گۆڤاری حەنەکی›.

**فکر** / fekr ، ـها؛ افکار/: [عربی]/اسم. بیر؛ ویر: ۱. هزر؛ هیزر؛ هژر؛ چالاکی ئاگەدارانەی زەین ‹فکر کردن: بیر کردنەوە› ۲. هزر؛ ئەندێشە؛ بەرهەمی ئەو چالاکیە ‹فکر روشن: بیری روون› ۳. باوەڕ؛ بروا؛ بۆچوون ‹فکر آزادیخواهی: باوەڕی ئازادیخوازی› ٤. ڕەت؛ نەخشە یان بەرنامە بۆ کار یان ئامانجێکی تایبەت ‹خریدن خانە، فکر خوبی بود: سەندنی ماڵ، بیرێکی باش بوو› ٥. خەیاڵ؛ یاد؛ خەم ‹فکر فردایت هم باش! فکر نکن همە چیز درست می‌شود: لە بیری سبەینێشدا بە! خەیاڵ مەکە هەموو شتیَ درووس دەبێت› ٦. [گفتاری] زەین؛ هۆش ‹فکر من کار نمی‌کند: بیرم کار ناکا›.

◘ **فکر بکر:** بیری دەژ؛ بیر و بڕوایەکی سەیر و بەکەڵک کە پێشتر بە بیری کەسدا نەهاتبیَ.

◘ **فکر چیزی/ کسی را نکردن:** خەمی شتیَ/ کەسیَ نەبوون/ نەخواردن؛ لە بیری شتیَ/ کەسێکدا نەبوون؛ بیر لە شتیَ/ کەسیَ نەکردنەوە ‹فکر پول را نکن، من آمادەاش می‌کنم: خەمی پارەت نەبیَ، من سازی دەکەم›.

**فکر خود را به کار انداختن:** بیری خۆ خستنە کار.

**فکر کردن:** بیرکردنەوە؛ بیرەوکردن؛ ویر کەردەیوە؛ پۆنجین ‹فکر کن ببین اشکال کار از کجاست: بیر کەرەوە بزانە گرفتی کار لە کوێدایە›.

**فکر کسی به جایی رفتن:** هۆشی کەسێک بۆ لایەک چوون؛ بیری کەسیَ بەرەو شوێنێک چوون ‹فکرم رفت به اعلانی کە به دیوار زده بودند: هوشم چوو بۆ لای ئەو ئاگاداریە دابوویان بە دیواردا›.

**فکر کسی پیش چیزی/ کسی بودن/ ماندن:** بیری کەسیَ بە لای شتیَ/ کەسێکەوە بوون؛ کەسیَ/ شتێک لە خەیاڵدا بوون ‹فکرش پیش زن و بچەاش بود: بیری بە لای ژن و منداڵەکەیەوە بوو›.

**فکر کسی را خواندن:** ناو چاوی کەسیَ خوێندنەوە/ دیتنەوە؛ لە مراز و ئارەزووی کەسیَ ئاگادار بوون ‹قبل از اینکه چیزی بگوید، فکرش را خواندم کە چە می‌خواهد: پێش ئەوەی شتیَ بڵێ، ناوچاویم خوێندەوە چی دەویَ›.

**از فکر چیزی/کسی بیرون آمدن:** بیری شتیَ/ کەسێک لە سەر دەرکردن؛ بیر لە شتیَ/ کەسیَ نەکردنەوە ‹باید از فکر مغازه خریدن بیرون بیایی: دەبیَ بیری دووکان کڕین لە سەرت دەرکەی›.

**از فکر کسی گذشتن:** بە بیری/ خەیاڵی/ کەسێکدا هاتن/ تێپەڕین ‹از فکر او نمی‌گذشت کە برادرش فریبش بدهد: بە بیریشیدا نەدەهات

براکەی فریوی بدا›.

**به فکر افتادن:** کەوتنە پەل و پۆ؛ کەوتنە بیر ‹به فکر افتاد **کارخانه بسازد:** کەوتە پەل و پۆ، کارخانە دانێ›.

**به/ در فکر کسی/ چیزی بودن:** لە بیری کەسێ/ شتێکدا بوون؛ لە شتێ/ کەسێ بیرکردنەوە ‹به فکر این بودم **بیایم با تو مشورت کنم:** لەو بیرەدا بووم بێم و تەگبیرێکت پێبکەم›.

**به فکر کسی رسیدن:** بە بیری کەسێکدا هاتن ‹به فکرم رسید **آدرسش را بپرسم:** بە بیرمدا هات ناونیشانی داوا بکەم›.

**توی/ در فکر رفتن:** ۱. بیرکردنەوە؛ چوونەوە نێو فکرەوە؛ ڕامان ‹مدتی توی فکر رفت **تا جوابی پیدا کند:** ماوەیێک بیری کردەوە تا وەلامێک بدۆزێتەوە› ۲. دژ دامان؛ دڵپەرۆش بوون ‹**وقتی فهمید از کارش خبر دارم** توی فکر رفت: کاتێ کە زانی لە کارەکەی ئاگادارم دژداما›.

**فکرت** / fekrat/: [عربی]*اسم.[ادبی]* بیر؛ ئەندێشە؛ ویر ‹**هر که** فکرت **نکند نقش بود بر دیوار:** کەسێکی بیر نەکاتەوە نەخشێکی لە سەر دیوارە›.

**فکر و خیال** / fekr-o-xiyāl ، ـها/: *اسم.* خەم و خەیاڵ؛ هەسەر؛ بیر و خەیالات؛ واتەویرە؛ بیر و خەیاڵ؛ بیر و خەم؛ بیر و نیگەرانی ‹**شب تا صبح** فکر و خیال **مریضی مادرم نگذاشت چشم روی هم بگذارم:** شەو تا بەیانی خەم و خەیالی نەخۆشی دایکم خەوی لێ حەرام کردم›.

**فکری**[1] / fekrî/: [عربی] *صفت.* هزری؛ بیری؛ هشکی ‹**کار** فکری: **کاری** هزری›.

**فکری**[2]: *قید.[گفتاری]* لە بیردا؛ لە فکردا؛ بە تێداماوی ‹فکری **مانده بودم چه بکنم:** لە بیردا مابوومەوە چ بکەم›.

**فکس** / faks/: [انگلیسی] ☜ **فاکس**

**فکس‌مودم** / faksmodem/: [انگلیسی] ☜ **فاکس‌مدم**

**فکسنی** / fakasanî/: *صفت.[گفتاری]* ۱. کۆنە؛ شڕە؛ لەکارتە ‹**خانەی فکسنی:** **ماڵە کۆنە**› ۲. مەڕاش؛ بێبایەخ ۳. لاواز؛ بێهێز ‹**آدم** فکسنی: **مرۆی لاواز**›.

**فکل** / fokol ، ـها/: [فرانسوی]*اسم.[قدیمی]* ۱. فوکول؛ ملیوانێ کە بە کلانە دەلکێتە کراسەوە ۲. فوکلە؛ خولامانە؛ کاکۆڵ؛ کاکوڕ؛ فلکە؛ فەکلە؛ کوودیلە؛ کوودڵە؛ قژی فڕدراوی پێشەسەر ۳. *[گفتاری]* کەراوات؛ کراوات؛ پروانک؛ بۆینباخ ٤. *[گفتاری]* پاپیۆن.

**فکلی** / fokolî ، ـها/: [فرانسوی] *صفت.[گفتاری]* فوکولی؛ کەراوات یان پاپیۆن لە مل.

**فکندن** / fekandan/: *مصدر.[مخفف]* خستن؛ داخستن؛ وستەی؛ وسەی؛ ئێخستن.

**فکور** / fakûr ، ـان/: [عربی] *صفت.[ادبی]* ۱. بیرمەند؛ هزرڤان؛ ژیروان؛ مژیوەر ‹**شخص** فکور: کەسی بیرمەند› ۲. دڵپەرۆش ‹**با حالت** فکور **نگاه می‌کرد:** بە دڵپەرۆشی دەیڕوانی›.

**فک‌وفامیل** / fak-o-fāmîl ، ـها/: [؟/ عربی]*اسم.[گفتاری]* کەس و کار: ۱. خزم و کەس؛ قەوم و خوێش ۲. سەرجەمی قەوم و قەبیلە ‹**فک و فامیل خود را برد:** کەس و کاری خۆی برد›.

**فکه** / fakke/: *اسم.* کەلووی باکووری؛ گوڵبەندی باکووری؛ کۆ هەسارەیێکە لە ئاسمانی باکووریدا.

**فکی** / fakkî/: [عربی] *صفت.* شەویلاکی؛ شەوی؛ شەویلەیی؛ شەویلگەیی ‹**استخوان فکّی:** پێشەی شەویلاکی›.

**فکین** / fakkeyn/: [عربی]*اسم.* شەویلەکان؛ شەویلاکەکان؛ شەویەکان ‹فکین **خود را بە هم می‌فشرد:** شەویلەکانی بەیەکدا دەنا›.

**فلاپی‌دیسک** / f(e)lāpîdîsk ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* فلاپی‌دیسک؛ پەڕەیەکی پلاستیکی بچووک بۆ نیانەکردنی زانیاری کەمپیوتەری: **دیسک؛ دیسکت**

**فلات** / falāt ، ـها/: [عربی]*اسم.* بان؛ بانی؛ بانو؛ دەشتی بەرز؛ بانە؛ ناوگەڕ؛ بۆڕگە؛ قیش؛

دەشتایی بلندتر لە دەور و بەری خۆی.

▣ **فلات قارە**: بەشێک لـە ئـاوی کنـارێنی هـەر وڵاتێ تا قووڵایی ١٢٠ میتر.

**فلاح** / falāh/: [عربی]/اسم. [ادبی] ڕزگاری.

**فلاح** / fallāh ، ـان/: [عربی]/اسم. [قدیمی] وەرزێـر؛ وەرزێڕ؛ کەشاوەرز؛ جووتیار؛ فەلا؛ جووتبەندە.

**فلاحت** / falāhat/: [عربی]/اسم. [قدیمی] وەرزێڕی؛ وەرزێـری؛ کەشـاوەرزی؛ جووتیـاری؛ فـەلایی؛ جووتبەندەیی.

**فلاخن**/ falāxan, falāxon ، ـها/: اسم. قەڵماسک؛ قەڵـماس؛ قاڵماسـک؛ قەڵماسـگ؛ قەڵماسـک؛ قەڵماسن؛ قەڵماسـەنگ؛ قەڵماسکە؛ بـەرکانی؛ کـەفکانی؛ کۆچکـانی؛ کۆچـک؛ کـەفچی؛ قۆچەقانی؛ کەوانپیتک؛ کەلەسونگ؛ کـەهینک؛ کەهنیک؛ کانیک؛ کانک؛ بەردەقانی؛ بەرزەقانیە؛ کەڤکانۆک؛ کەهنی؛ بەرەقانی؛ قانـک؛ هـەفچار؛ سەپان؛ دارلاستیک؛ کەفڕکانی؛ کەرەسـەیێ بـۆ فڕێدانی وردەبەرد، بە شـێوەی تیکەچـەرم یـان قوماشێکی قایم و دوو بەنی درێـژ لـە هـەر دوو سەریەوە: **قلابسنگ؛ قلماسنگ**

**فلاسفه** / falāsefe/: [عربی] جمعِ ☜ **فیلسوف**

**فلاسک** / f(e)lāsk ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. مـەتارە؛ مەتارێ؛ فلاسک؛ فـەلاکس؛ فەلاکسـە؛ سـارد و گەرم؛ دەفرێکی دوو دیوارە بـۆ ڕاگـرتنی تـینی ئەوی تێدەکرێ ‹فلاسک چای: مەتارەی چای›.

**فلاش** / f(e)lāš ، ـهـا/: [انگلیسـی]/اسم. [عکاسی] فلاش؛ چرا یان لامپێ بۆ بەدیهێنانی تیشـکێکی ڕووناک و زۆر، وێڕای گرتنی وێنە.

**فلاش‌بک** / f(e)lāšbak ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. کـار و ڕەوتی بادانـەوە؛ هەڵـگەڕانەوە (لـە فـیلم یـان چیرۆکدا).

**فلاش‌تانک** / f(e)lāštānk ، ـها/: [انگلیسـی]/اسم. کۆگە ئاوی سیفون.

**فلافل** / falāfel/: [عربـی]/اسم. فلافـل؛ فـەلافل؛ خۆراکێ لە ئاردەنۆک و سێفەزەمینی و بیبـاری تیژ کە لە نـانی دەپـێچن و لـە ڕۆنـدا سـووری دەکەنەوە.

**فلاکت** / falākat ، ـها/: [از عربی]/اسم. داماوی: ١. زەبـوونی؛ زەلیلـی ٢. فەلاکـەت؛ هـەژاری؛ دەسکورتی؛ بەلەنگازی.

**فلاکتبار** / falākatbār/: [از عربـی/ فارسـی] صفت. داماوانە؛ هەژارانە؛ بە ئەوپەڕی داماویەوە ‹زندگی فلاکتبار: ژیانی داماوانە›.

**فلامینگو** / f(e)lāmîngo ، ـهـا/: [اسپانیایی]/اسم. ماسیخۆرە؛ سورەقولنگ؛ قولـینگ؛ سـوورەقاز؛ فلامینگۆ؛ پەلەوەرێکی گەورەیە بە قـول و ملـی درێژ و دەندووکی وەک سۆنە بـەلام چـەماوەوە کە بۆ خۆراک قوڕ و چلپاوی پـێ دەکۆڵـێ. بـە کۆمەڵ دەژی و لە سەر قـوڕ و ئـاوی کـەرخاودا هێلانە دەکا: **مرغ‌آتشین؛ مرغ حسینی**

**فلان** / folān, felān/: [عربی] ضمیر. فلان؛ فـلان؛ فران؛ فلانە؛ جایی؛ هەرامەواک؛ فیسکە؛ ئـەوەی ناوی نابەن ‹فلان کس؛ فلان چیز؛ فلان شهر: فـلان کەس؛ فلانە شت؛ فیسکە شار›.

**فلانـــدری** / f(e)lāndarî/: اسـم. فەلانـدەری؛ فلاندەری: ١. ـها؛ ـان/ هەر یەکە لە دانیشتووانی فەلانـدەر لـە بـاکووری وڵاتی بلژیـک ٢. لـە زمانەکانی ژێرمەنی کە لە فەلاندەردا باوە.

**فلانژ** / f(e)lānj/: [فرانسوی]/اسم. [صنعت] لێـوارە؛ لێـوارەی ئـامراز یـان پـاژێکی میکـانیکی (زیـاتر کانزایی) وەک بان و خواری تیرئاسن.

**فـلان‌کـس** / folānkas, felān-/: [عربـی/ فارسـی] ضمیر. فلانکەس؛ فلانەکەس؛ فلانی؛ لـۆ؛ کـاورا؛ جایی؛ کەسێ کە ناوی نابەن ‹بگو فـلانکس بـا شما کار دارد: بڵێ فلانکەس کاری پێتانە›.

**فلانل** / f(e)lānel/: [انگلیسی]/اسم. ١. پۆپەشمین؛ پۆپەزمین؛ پارچەی پەشمی شـلچـن و پـرزدار ٢. شـەمەد؛ پارچـەی بـەنی نـەرم و پـل وەک پارچەی پەشمی.

**فلانـی** / folānî ,felānî/: [عربـی] ضمیر. فـلانی؛

فلانه‌کەس؛ چەتور؛ تاین؛ کەلّپا؛ ئاماژە بە کەسێک کە نەیانەوێ نێوی بەرن ‹بە آقا بگو فلانی آمده: بە ئاغا بڵێ فلانی هاتووه›.

**فلج**[1] / falac/: [عربی]/اسم. فالێنج؛ ئیفلیج؛ شەپلە؛ شپلە؛ شیک؛ کوچ؛ کوچی؛ کود؛ لەمس؛ قرۆت؛ قرۆپ؛ هەو؛ شەهتی؛ دۆخی کەم بوون یان نەبوونی چالاکی دەماری لە بەشێکی لەشدا، کە دەکرێ هەستی، جووڵەیی یان پێکەوە بێ.

▣ **فلج اطفال**: فالێنجی منداڵان؛ دۆخی چڵک کردنی چەتوونی ماکی بۆری مێشک لە منداڵاندا کە سەرەتا یاو و پاشان فالێنجی ماسوولە بار دێنێ.

**فلج تشنجی**: پارکینسۆن؛ شەپلەیەک کە سەر و چاوی نەخۆش دادەگرێ و ئەندامەکانی دەخاتە لەرەوە: **بیماری پارکینسُن**

**فلج**[2] / ـها/: [عربی] صفت. گۆج؛ کوچ؛ کۆچ؛ گۆت؛ شات؛ شەخت؛ ئیفلیج؛ گولۆڵە؛ گلۆڵە؛ داملە؛ لەپۆل؛ لەسم؛ لەمس؛ شەپلە؛ گەپۆل؛ قرۆپ؛ شەپلە لێدراو ‹پای فلج: پای گۆج›.

**فلدسپات** / feldespāt/: [فرانسوی/ از آلمانی]/اسم. فیلدسپات؛ بەردی ئاگرینی بلۆری کە پتر لە سیلیکاتی ئالومینیۆمە لەگەڵ سوود، پوتاس یان ئاهەکدا: **فلدسپار**

**فلدسپار** / feldespār/: [فرانسوی] ☜ **فلدسپات**

**فلز** / felez(z) ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. کانزا؛ ویرە؛ ماکێکی زۆرتر قورس و ڕەق کە دەتاوێتەوە، چەکوشخۆرە، وەک تەلی لێ‌دێ، بۆ سوان و لووس کردن دەبێ، کارەبا و گەرما لە خۆی ڕادەگوێزێ و بە لە دەست دانی یۆن باری کارەبایی هەڵدەگرێ و ئۆکسید و هیدروکسید بەرهەم دێنێ.

▣ **فلز بابیت**: کانزای بابیت؛ کانزای یاتاقان کە لە ئالیاژی قەلا و ئانتیموان و مس پێک‌دێت.

**فلز پست**: کانزایێ کە لە خۆوە ژەنگ دێنێ (وەک ئاسن).

**فلز نجیب**: کانزای نەجیب؛ کانزایەک کە ژەنگ ناهێنێ و تەنانەت لە ئەسیددا ناتوێتەوە (وەک زێڕ و پلاتین).

**فلز نرم**: کانزای نەرم؛ کانزایێ کە بەبێ گەرم کردن لە ژێر چەکوچدا نەرم دادێ (وەک سرپ).

▣ **فلز کسی خراب بودن**: *[کنایی]* وەک گوریسی ناو هەنبانە بوون؛ تەقەڵ لەسەر یەک نەبوون؛ بەگرێ وگۆڵ بوون؛ جنسی کەسێ خراو بوون؛ تۆم کەسێ حەرام بوون؛ گەڕباز و نادروس بوون.

**فلزکاری** / felezkārî/: [عربی/ فارسی]/اسم. کانزاگەری؛ کار و ڕەوتی بیچم دان بە کانزا و کار و باری جۆراوجۆری پیشەیی و هونەری.

**فلزگری** / felezgarî/: [عربی/ فارسی] ☜ **متالورژی**

**فلزنگاری** / feleznegārî/: [عربی/ فارسی]/اسم. تۆژینەوە لە پێکهاتەی کانزا بەتایبەت بە کەڵک وەرگرتن لە میکروسکۆپ.

**فلزی** / felezî/: [عربی] صفت. کانزایی: ١. سەر بە کانزا ٢. لە جنسی کانزا ٣. بە ڕەنگ یان بیچمی کانزاوە.

**فلس** / fals ، ـها/: اسم. پوولەکە؛ پوولەکە؛ پووڵەکێ؛ پوولک؛ پوولەکەماسی؛ قرش؛ پەڕە وردەی پشتی ماسی.

**فلسفه** / falsafe/: [معرب از یونانی]/اسم. فەلسەفە: ١. زانستی قانوونگەلی زاڵ بە سەر هەستی (سروشت و کۆمەڵگا)، بیر و ڕەوتی وریاییدا ٢. باس و لێدوان لەمەڕ نیشانەگەلی هەستی و بایەخەکانەوە ٣. *[کنایی]* هۆی کار یان ڕووداوێک ‹فلسفه‌ی این کار چه بود؟: فەلسەفەی ئەم کارە چ بوو؟›.

**فلسفه‌بافی** / falsafebāfî ، ـها/: [معرب/ فارسی]/اسم. درێژدادڕی؛ بەڵگە و شانەک هێنانەوەی دوور و درێژ بۆ پاکانەی کار یان دیاردەیەک.

**فلسفی / falsafî/:** [معرب] *صفت.* فه‌لسه‌فی؛ سه‌ر به فه‌لسه‌فه ‹مکتب فلسفی؛ استدلال فلسفی: قوتابخانه‌ی فه‌لسه‌فی؛ به‌ڵگه هێنانه‌وه‌ی فه‌لسه‌فی›.

**فلش / f(e)leš/:** [فرانسوی] ☜ **پیکان–٣**

**فلفل / felfel ، ـها/:** [معرب از سنسکریت] *اسم.* ئاڵه‌ت؛ ئیسۆت؛ ئیسیوه‌ت؛ فلفل؛ بیبار؛ بیوار؛ بیبه‌ر؛ گیزک؛ به‌ری چه‌ن گیای تون و تیژ که وه‌ک سه‌وزی، به‌هارات یان ده‌رمان به کار دێن.

▣ **فلفل آبی:** بیباری ئاوی؛ گیایه‌کی ئاڵفی وێنه‌ی ڕێواس، تایبه‌تی ناوچه‌ی شێداره به گه‌ڵای ڕوونی ده‌ندووکه‌یی یان درێژ و تامی توونه‌وه که بۆ ده‌رمان ده‌شێ.

**فلفل برّی** ☜ **پنجانگشت – ٢**

**فلفل حقیقی** ☜ **فلفل هندی – ١**

**فلفل درختی:** گه‌نده‌بیبار؛ داربیبار؛ دره‌ختێکی هه‌میشه سه‌وز و جوانه به به‌ری په‌مه‌یی و گوڵی سپی مه‌یله‌و زه‌رده‌وه، بیباری نیه و هه‌ر بۆ جوانی ڕایده‌گرن.

**فلفل دلمه‌ای:** بیباری دۆڵمه؛ بیبار دۆڵمه‌یی؛ کاڵه بیبار؛ جۆرێک بیباری گه‌وره، به ڕه‌نگی سه‌وز، زه‌رد و بڕێ جار سوور که تامی هێندێک توونه‌وه و وه‌ک سه‌وزی ده‌خورێ و دۆڵمه‌شی لێ دروست ده‌کرێ.

**فلفل سبز** ☜ **فلفل قرمز**

**فلفل سفید:** بیباری سپی؛ به‌ری گه‌یوی بیباری هیندی به ڕه‌نگی بۆری مه‌یله‌و سپی و تیژی و تووونی زۆره‌وه.

**فلفل سیاه:** گووزه‌ک؛ بیباری ڕه‌ش؛ به‌ری نه‌گه‌یوی بیباری هیندی که پێش له گه‌یین ده‌چنرێ و وشک ده‌کرێته‌وه، ڕه‌شه و کوتراوه‌که‌ی وه‌ک به‌هارات به کار ده‌چێ.

**فلفل شیرین:** بیباری شیرین؛ به‌ری باریک و درێژی جۆرێک بیباری سه‌بزی که‌م‌توونه که وه‌ک سه‌وزی ده‌خورێ.

**فلفل فرنگی** ☜ **فلفل قرمز**

**فلفل قرمز:** هچار؛ هیچار؛ بیباری سوور؛ بیبه‌ڕۆکه؛ گیایه‌کی ئاڵفی به ساقه‌ته‌ی بێ‌کولک، گه‌ڵای ناسک، گوڵی سپی مه‌یله‌و زه‌ردی بچووک، میوه‌ی گۆشتنی بۆنخۆش و توون و تۆمی سپی زۆره‌وه که سه‌ره‌تا سه‌وزه و پاشان سوور ده‌بێ و وه‌کوو سه‌وزی له چێشت و سالاد ده‌کرێ: **فلفل سبز؛ فلفل فرنگی**

**فلفل هندی:** ١. ده‌وه‌نێک به لاسکی نیوه‌چێوی، گوڵی کۆ، به‌ری بچووکی خڕ و زۆره‌وه که پاش پێ گه‌یین وه‌کوو هێشوو به‌ر ده‌بێته‌وه ٢. به‌ری وشکه‌وه بووی ئه‌م ده‌وه‌نه: **فلفل حقیقی**

**فلفل‌نمکی / felfelnamakî/:** [معرب/ فارسی] *اسم.* ١. خۆڵه‌مێشی؛ بۆرکار ٢. بازگ؛ بازی؛ ڕه‌ش و سپی؛ به‌ڵه‌ک؛ ڕه‌ش ـ به‌ڵه‌ک؛ برنجی.

**فلفلی / felfelî/:** [معرب] *صفت. [مجازی]* کوته‌ڵه؛ زرکه‌تاڵه؛ وردیله و بزێو.

**فلق / falaq/:** [عربی] *اسم.* سپێده؛ کازێوه؛ تاوهه‌ڵات؛ به‌یان.

**فلک / falak/:** [عربی] *اسم.* ١. /ـها؛ افلاک/ فه‌ڵه‌ک؛ فه‌له‌ک؛ چه‌رخ؛ خولگه‌ی هه‌ریه‌که یان کۆمه‌ڵێک له ته‌نگه‌لی ئاسمانی ٢. *[مجازی]* گه‌ردوون؛ ئاسمان؛ ئه‌سمان؛ ئاسیمان؛ ئاسمێن؛ ئاسمیه؛ ئه‌زمان؛ ئازمان؛ ئازمین؛ ئازمێن؛ ئه‌زموو ٣. فه‌لاقه؛ فه‌راقه؛ چێوفه‌ڵه‌ک؛ نه‌سته‌ق؛ په‌ت و دارێکه له پای تاوانباری ده‌پێچن و دارکاری ده‌که‌ن: **چوب‌فلک**

▣ **فلک کردن:** فه‌لاقه‌کردن؛ نه‌سته‌ق‌کردن؛ له فه‌لاقه دان و لێدان.

**فلک‌البروج / falakolburûc, -borûc/:** [عربی] ☜ **دایرةالبروج**

**فلک‌زده / falakzade ، ـها؛ ـگان/:** [عربی/ فارسی] *صفت. [مجازی]* داماو؛ ده‌رمه‌نه؛ کلۆڵ؛ قوڕه‌ماو؛ چاره‌ڕه‌ش؛ سیاچاره ‹مرد فلک‌زده را از خانه‌اش

بیرون انداختند: پیاوە داماوەکەیان لە ماڵەکەی خستە دەرەوە›.

**فلکلور** / folk(e)lor/: [انگلیسی/ فرانسوی]/*اسم*. فولکلۆر؛ فەرهەنگی خەڵک؛ فەرهەنگی مەردم؛ کەلەپووری کولتووری میللەتێک: **فولکلور**

**فلکلوریک** / folk(e)lorîk/: [فرانسوی] *صفت*. فولکلۆری؛ سەر بە فەرهەنگی خەڵک: **فولکلوریک**

**فلکه** / falake ، ـها/: [عربی]/*اسم*. فەلەکە: ١. گرد؛ مەیدان؛ خولگە؛ جێی پێک‌گەیشتنی چەند شەقام ٢. شێر فەڵەک؛ شێرێکی جەغز لە سەر بۆ بەستن و بەردانی تراوێک ٣. پوولی؛ چەرخێ کە هێندی گەڕانی موتۆر ڕادەگوێزێ.

**فلکی** / falakî/: [عربی] *صفت*. ئاسمانی؛ گەردوونی؛ چەرخی ‹جرم فلکی: تەنی ئاسمانی›.

**فلنگ** / feleng/:/*اسم*. ١. پاڵمەنگ؛ پاڵەهەنگ؛ کۆت و زنجیری پای زیندانی ٢. *[قدیمی]* پێڵاو؛ کەوش؛ پێوەرە.

▣ **فلنگ بستن**: *[مجازی]* پێچ‌کردنەوە؛ باریکەوبوون؛ دووچکە نانە سەرشان؛ جووچکە نیانە سەرکۆڵ؛ کۆچەوکردن؛ فیسماڵک/ فیزماڵک دان؛ خۆ دزینەوە؛ تێ‌تەقاندن ‹تا پلیس را دید فلنگ را بست: هەر چاوی بە پولیس کەوت پێچی کردەوە›.

**فلنگ در رفتن**: *[مجازی]* داکشان؛ درێژبوونەوە؛ بوورانەوە؛ لە سەر خۆ چوون ‹تا خون می‌بینم فلنگم در می‌رود: هەر خوێن دەبینم دادەکشێم›.

**فلوئور** / f(e)lo'ûr/: [فرانسوی]/*اسم*. فلوئور؛ توخمی کیمیایی ناکانزا بە ژمارەی ئۆتمی ٩ و کێشی ئوتومی ١٨,٩٩ لە دەستەی هالۆژینەکان کە لە بار و دۆخی ئاساییدا بە ڕەنگی سەوزی کاڵە و لە ئاو و ئەلکولدا دەتوێتەوە و بۆ بەرهەمهێنانی پلاستیکی باش لە دەزگاگەلی سەرماوەز و هەویری ددانشۆری دژی کرمۆڵی بە کار دێت.

**فلوئورسان** / f(e)lo'ûrsān/: [فرانسوی] ☜ **فلورسنت**

**فلوئورسانس** / f(e)lo'ûrsāns/: [فرانسوی] ☜ **فلورسانس**

**فلوت** / fulût, folût ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم*. فلووت؛ فلووتە؛ سازێکی بازەنی لوولەیی، پتر چێوی یان پلاستیکی و بێ‌زمانە، کە هەناسەی ژەنیار لە کونەکانی سەریەوە دەچێتە ناو و بە قامک لە سەر کونەکان دانان و لابردن و نۆتی مووسیقای پێ دەژەنرێ.

**فلورسانس** / f(e)loresāns/: [فرانسوی]/*اسم*. فلورسانس؛ تایبەتمەندی برێ شت کە پاش تیشک لێدانیان تیشک دەدەنەوە: **فلوئورسانس**

**فلورسنت** / f(e)loresent/: [فرانسوی] *صفت*. تیشکدەرەوە؛ فلورێسێنت؛ خاوەنی تایبەتمەندی فلورسانس: **فلوئورسان**

▣ **لامپ فلورسنت** ☜ **لامپ**

**فلورن** / f(e)loran/: [فرانسوی]/*اسم*. فلورەن؛ یەکەی پارەی وڵاتی هولەند پێش یورۆ.

**فلوس** / fulûs, folûs ، ـها/: [عربی]/*اسم*. فلوس: ١. جۆرێک داری سەمەر لە ناوچەی گەرمیان بە گەڵای گەورە و گوڵی زەردەوە ٢. مێوەی ئەو دارە کە شیرین و هێندێک بۆسارە و بۆ ڕەوان‌کردنی سک بە کەڵک دێ.

**فله** / falle/: [؟] *صفت*. فەلە؛ شفتە؛ دانگۆ؛ بەبێ بەستە و دەفر ‹سیمان فلّه: سیمانی فەلە›.

**فله‌ای** / falle'î/: [؟] *قید*. فەلەیی: ١. شفتە؛ بە شفتە؛ وە دانگۆ ‹این ماکارونی را فلّه‌ای خریدم: ئەم ماکارۆنیەم شفتە کری› ٢. *[تعریض]* بەبرە؛ بەبێ وردبوونەوە و تێڕوانین ‹همه را فلّه‌ای توقیف کردند: هەموویان بەبرە گرت›.

**فله‌بر** / fallebar/: [؟/ فارسی] *صفت*. فەلەبەر؛ شفتەبەر؛ لێهاتوو بۆ بردنی شت و مەکی فەلە ‹کشتی فلّه‌بر: گەمیەی فەلەبەر›.

**فم‌المعده** / famolme'de/: [عربی]/*اسم*.

*[کالبدشناسی]* دەمگەدە؛ شوێنی کرانەوەی سۆرانچک بۆ ناو گەدە.

**فمینیسم** / femînîsm/: [فرانسوی]/*اسم.* فێمینیسم: ١. لایەنگری لە یەکسانی مافی ژن و پیاو لە کۆمەڵگادا ٢. بیرۆکەی یەکسانی ڕامیاری، ئابووری وکۆمەلایەتی ژن و پیاو.

**فن** / fan(n) ، ـها؛ فنون/: [عربی]/*اسم.* لێزانی؛ لمر؛ لمره؛ فەن؛ دەگەر: ١. ئادا؛ ڕێوشوێنی کردنی کارێ کە فێر بوون و ئەزموونی پێویستە ‹فن کشاورزی: لێزانی کشتوکاڵ› ٢. زانیاریگەلی سەر بە پیشەسازی ‹علم و فن: زانست و لێزانی›.

**فن** / fan ، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* باوەشێن؛ پەڕە؛ پانکە؛ فەن؛ کەرەستەیەک بۆ بەدیهێنانی با کە بە وزەی کارەبا کار دەکا.

**فنا**[1] / fanā/: [عربی]/*اسم.* نستی؛ بالمیش؛ شۆلگەنە؛ قرپ؛ ئاسەواربڕاوی؛ نابوودی.

**فنا**[2]: *صفت.* نسک؛ کلێس؛ نەماو؛ نابوود.

▣ **فنا شدن:** قرتێچوون؛ قران؛ ئاسەوار بران؛ بنبڕ بوون؛ بنەبڕ بیەی؛ نەمان ‹هرچه داشت همه یک شبه فنا شد: هەرچێکی هەبوو هەمووی بەشەوێ قڕی تێچوو›. هەروەها: **به باد فنا دادن؛ بە باد فنا رفتن**

**فناپذیر** / fanāpazîr/: [عربی/ فارسی] *صفت.* مرۆک؛ بەرمەرگ؛ نەمێن؛ نەمەن؛ بە تایبەتمەندی نەمان و فەوتانەوە.

**فناتیک** / fenātîk, fanātîk ، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* سەرسەری؛ تێکولی؛ بەبێ توانستی لێکدانەوە و باش تێگەیشتن.

**فناناپذیر** / fanānāpazîr/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بمێن؛ مانا؛ بە دوور لە مردن و فەوتان.

**فناور** / fanāvar ، ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* لێزان؛ تیکنولۆژیست؛ سەردەرچوو لە تیکنولۆژیدا.

**فناورانه** / fanāvarāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* لێزانانە؛ تیکنولۆژیکی؛ سەر بە تیکنولۆژی.

**فناوری** / fanāvarî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* لێزانی؛ تیکنولۆژی.

**فنجان** / fencān ، ـها/: [معرب از یونانی]/*اسم.* پیالە؛ کووپ؛ فینجان؛ گمگمە؛ شەبک؛ فنجان؛ موتک: ١. دەفری بچووکی دەمهەراوی دەسکدار بۆ خواردنەوەی شتی گەرم ٢. دەفر و ناوەرۆکەکەی ‹یک فنجان قهوه: پیالەیەک قاوە› ٣. *[قدیمی]* جۆرێک یەکەی ئاودێری کۆن: **پنگان**

**فنداسیون** / fendāsiyûn/: [فرانسوی]/*اسم.* بنەڕەت؛ بناخە؛ بناغە؛ هیم؛ خیم؛ بنڕەخ؛ بنگە؛ بنواشە: ١. هەر شتێ (وەک بیتون و ئارماتور و...) کە بنچینەی خانووبەرەی پێ دەچنن ٢. چۆنیەتی چوونە کاری ئەو شتانە ❋ **فُوندانسیون**

**فندق** / fandoq ، ـها/: *اسم.* فنق؛ فنەق؛ فنۆق؛ فنقی؛ فندق؛ کەلووز: ١. دارۆچکەیەکی گەڵا گنجڕی کولکنە بە گوڵی پەلداری سوور و سپی و میوەی خڕەوە ٢. بەری داری کەلووز کە خڕ و گچکەیە و توێکڵی قاوەیی و ڕەقە و کاکڵەکەی تەڕی لە ڕۆنە و وەکوو چەرەز دەخورێ.

**فندق‌شکن** / fandoqšekan ، ـها/: *اسم.* ١. فنەقشکێن؛ کەرەستەی ئەمورئاسای تایبەت بۆ شکاندنی فندق و گوێز و... ٢. ناوی باڵدارێکی وەک قەل کە زۆرتر گوێز و فندق و شتی وا دەخوا.

**فندقه** / fandoqe ، ـها/: *اسم. [گیاەشناسی]* میوەی وشکی ناشکۆفا بە دەنکێک کاکڵەوە (وەک فندق و پستە).

**فندقی** / fandoqî/: *صفت.* فنەقی؛ فندقی؛ فنقی؛ فنۆقی: ١. فنقدار؛ بە فنق ‹شکلات فندقی: شوکولاتی فنەقی› ٢. بەرەنگی فندق؛ بە ڕەنگی قاوەیی نزیک بە سوور ‹چوب فندقی: چێوی فنقی› ٣. بە بیچمی فنق ‹دانه تسبیح فندقی: **دەنکە تەزبێحی** فنۆقی› ٤. *[کنایی]* گوێزەبیل؛ **بووچک** و ورد بە ئەندازەی فنق ‹آدم فندقی: بنیادەمی گوێزەبیل›.

**فندک** / fandak ، ـها/:/اسم. فەنەک؛ فەندەک: ١.چەرخ؛ چەخماخ؛ ئامرازێکی چکۆلەی بریتی لە دەستە و بەردەچەخماخ و سووتەمەنیەک بۆ هەڵکردنی خێرای ئاور ٢. هەر ئامرازێکی کارەبایی یان باتریخۆر بۆ هەڵکردنی ئاور.

**فنر** / fanar ، ـها/: [ترکی]/اسم. فەنەر؛ فەنەرە؛ کەڤان؛ کەرەستەیەکی کێشسانی کە پاش نەمانی هێزی دەرەکی، بۆ دۆخەکەی خۆی دەگەڕێتەوە، بەتایبەت لەتە کانزایێ کە بە هۆی بادران و مووچانەوە وای لێ هاتبێ.

**فنربندی** / fanarbandî ، ـها/: [ترکی/ فارسی]/اسم. ١. کار و ڕەوتی دابەستنی تۆڕێک لە فەنەر لە ژێر دیوی ماشێن بۆ کەمکردنەوەی هەڵخە و داخە و جیا نەبوونەوەی تەگەرەکانی لە زەوی ٢. تۆڕی فەنەری ژێر کەرەستەی ماشێن.

**فنری** / fanarî/: [ترکی] صفت. فەنەری: ١. وەکوو فەنەر ٢. فەنەردار ٣. کێشسان؛ بە تایبەتمەندی کێشسانیەوە.

**فن‌سالار** / fansālār ، ـها؛ ـان/: اعربی/ فارسی]/اسم. کارامە؛ لە کار زان؛ تیکنوکرات.

**فن‌سالاری** / fansālārî/: [عربی/ فارسی]/اسم. کارامەیی؛ تیکنوکراتی.

**فنک** / fanak/: [عربی]/اسم. ونەک؛ گووزە؛ جۆرێ ڕێوی بچووکی دڕندە، بە گوێی گەورە وەک هی سەگ، پێستی خاکی مەیلەو سوور و کلکی ڕەشەوە کە پێست و تووکەکەی بە نرخن و زۆرتر لە باکووری ئەفریقادا دەژی

**فن‌کوئل** / fankû'el ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. فەن‌کوەیل؛ دەزگای باگۆڕ بریتی لە باوەشێن و کلافێ لوولەی ئاوی سارد یان گەرم کە با بە نێو کلافەکەدا دەگەڕێ و سارد یان گەرم دەبێتەوە: **فن‌کویل**

**فن‌کویل** / fankoyl/: [انگلیسی] ☜ **فن‌کوئل**

**فنل** / fenol/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] فینول؛ ماکی بلۆرینی بێڕەنگ کە لە ئاو و ئەلکول و گلیسریندا دەتوێتەوە، دژگەنێکی بەهێزە و لە بەرهەمهێنانی ڕەنگ، داودەرمان و پلاستیکدا بە کەڵک دێ: **کربولیک‌اسید؛ فنیک‌اسید**

**فنل فتالئین** / fenolfetāle'în/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] فینول‌فیتالێئین؛ ماکێکی بلۆرینی سپی کە لە ئەلکولدا باش و لە ئاودا هێندێک دەتوێتەوە و سک ڕەوان دەکا و لە ڕەنگسازیدا بە کەڵک دێ.

**فنوتیپ** / fenotîp/:/اسم. [زیست‌شناسی] فینوتیپ؛ کۆمەڵە پێناسەگەلی ڕواڵەتی کە بوونەوەرێکی زیندوو بە ئەندامی دەستەیەک دەناسێنێ، هەروەها دەستەیەک لە گیانداران کە لە ڕواڵەتدا وەکوو یەک وان، بەڵام لە پێکهاتەی ژینەتیکیدا جیاوازن.

**فن‌ورز** / fanvarz/: [عربی/ فارسی]/اسم. لێزان.

**فنومن** / fenomen ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. دیاردە؛ دیاردی: ١. بەرچاوە؛ ئەوی دەبیندرێ یان هەستی پێ‌دەکرێ ٢. نۆڕسک؛ شتی تازە دەرهاتوو.

**فنومنولوژی** / fenomenoljî/: [فرانسوی]/اسم. دیاردەناسی: ١. لێکۆڵینەوە لە چۆناوچۆنی هزری مرۆ وەکوو پێشەکیەک بۆ چوونە ناو باسی فەلسەفیەوە ٢. ڕێزکردنی هەموو دیاردەی سەر بە ناسینەوەی شتێک.

**فنون** / funûn, fonûn/: [عربی] جمعِ ☜ **فن**

**فنی** / fannî/: [عربی] صفت. ١. پێوەندیدار یان سەر بە فەنەوە ٢. /ـها؛ ـان/ فەنزان؛ لێزان؛ زانا بە فەن.

**فنیقی**[1] / fenîqî, finîqî/:/اسم. فینیقی: ١. هۆزێ کە لە وڵاتی کۆنی فینیقیەدا دەژیان ٢. /ـها؛ ـان/ هەر کام لە خەڵکی ئەو هۆزە ٣. زمانی ئەو هۆزە، لە زمانگەلی سامی.

**فنیقی**[2]: صفت. فینیقی؛ سەر بە وڵاتی فینیقیە.

**فنیک‌اسید** / fenîk asîd/: [فرانسوی] ☜ **فنل**

**فنیل** / fenîl/: [انگلیسی]/اسم. [شیمی] فینیل؛

بەرهەمهاتوو لە فینول.

**فنیل‌آلانین** / fenîl ālānîn /:[انگلیسی]/اسم. فینیل‌ئالانین؛ لە ئەسید ئامینەگەلی زۆر پێویستی ژیانی مرۆ.

**فواحش** / favāheš /: [عربی] جمعِ ☜ **فاحشه**

**فواره** / favvāre ، ـها/: [عربی]/اسم. فیشکە؛ فیچقە؛ فیجقە؛ فوارە؛ کوفارە؛ کفارە؛ کولکولە؛ فوویرەک؛ پیت: ۱. کەرستەیێ کە ئاو و ماکی تراو بەرەو سەر دەپژێنێ ۲. شێرێ کە بۆ ئەم کارە بە کار گیراوە.

▣ **فواره زدن:** پرشیان؛ پرشان؛ فیچقەکردن؛ پرشانی تراوێک بە تەوژمەوە ‹تا شیر آب را باز کردم آب فواره زد بە سر و صورتم: تا شێرەکەم کردەوە ئاو پرشیا بە سەر و چاومدا›.

**فواصل** / favāsel /: [عربی] جمعِ ☜ **فاصله**

**فواید** / favāyed /: [عربی] جمعِ ☜ **فایده**

**فوب** / fob /:[انگلیسی]/اسم.[مخفف، بازرگانی] فۆب؛ ڕەوتی ڕادەست کردنی کالا لە ترمینالی بارگری سەرەتادا.

**فوت** / fo:t, fowt /: [عربی]/اسم. ۱. ڕووداوی مردن؛ تێدا چوون ‹فوت پدرش سه سال پیش بود: مردنی بابی سێ‌سالی پێش بوو› ۲. کارەساتی لە دەس دان؛ لە دەس چوون ‹فوت وقت: لە دەس‌دانی کات›.

▣ **فوت وقت:** لە دەس چوونی کات؛ تێپەڕ بوونی کات.

▣ **فوت شدن/ کردن:** مردن؛ تێدا چوون؛ فەوتان.

**فوت** / fût /:/اسم. ۱. فوو؛ پف؛ پفوو؛ با یان هەوایێ کە لە دەمەوە فت دەکرێ ۲. [انگلیسی] فووت؛ پا؛ یەکەی درێژایی ئینگلیسی و ئەمریکی، بەرامبەر بە ۳۰,٤۸ سانتی‌میتر (۱۲ ئینچ): **پا**

▣ **فوت مربّع:** فووتی چوارگۆشە؛ یەکەی ڕووبەری ئینگلیزی و ئەمریکایی بەرامبەر بە ۹۲۹ سانتی‌میتری چوارگۆش.

**فوت مکعّب:** فووتی چوارپاڵوو؛ یەکەی بارستایی ئینگلیزی و ئەمریکی بەرامبەر بە ۲۸,۳۲ دسیمیتری چوارپاڵوو.

▣ **فوت آب بودن:**[گفتاری] ڕەوان بوون؛ باش زانین.

**فوت کردن:** ڤەزین؛ فووکردن؛ پف‌کردن؛ بە گوشارەوە با لە دەم دەرکردن.

**فوتبال** / fûtbāl /: [انگلیسی]/اسم. فووتباڵ؛ تۆپان؛ گۆگاپێ؛ تۆپی‌پێ؛ یاریەکی مەیدانیە لە نێوان دوو تیمدا، بە تۆپێکەوە، کە هەر کام لە سەرێکی مەیدانەوە دەروازەیان هەیە و مەبەستیان بە پێ خستنی تۆپەکەیە بۆ نێو دەروازەی بەرامبەریان.

**فوتبالیست** / fûtbālîst ، ـها/: [از انگلیسی]/اسم. فووتبالیست؛ یاریزانی فووتباڵ.

**فوتسال** / fûtsāl /: [انگلیسی]/اسم. فووتساڵ؛ یاری فووتباڵ لە شوێنی سەرگیراو، بە تۆپێکی گچکە لە مەیدانێکی بەرتەسکدا.

**فوتک** / fûtak ، ـها/:/اسم. پژێنە؛ کەرەستەی پژاندنی تراو، بەتایبەت ڕەنگ بە سەر ڕووبەرێکدا، بریتی لە دەمنەیەک بۆ فوو تێکردن و دوو لوولە کە یەکیان لە نێو تراوەکەدایە و لەوی دیشەوە تراوەکە دەپژێ.

**فوتو** / foto /: [فرانسوی] ☜ **فُتُو**

**فوتوریست** / fûtûrîst ، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* فوتوریست؛ لایەنگری فوتوریسم.

**فوتوریسم** / fûtûrîsm /: [فرانسوی]/اسم. فوتوریسم: ۱. ڕاپەرینی هونەری و وێژەیی سەرەتای سەدەی بیستەم، بەتایبەت لە ئورووپادا، کە لە سەر ڕانانی هێزی بزێو و کار و ڕەوتی ماشینی جەخت دەکا و ناپەرژێتە سەر بزواندنی هەست و نەستەوە ۲. جەخت لە سەر گرینگی داهاتوو و دەسکەوتەکانی.

**فوت‌وفن** / fût-o-fan ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. [گفتاری] فەن‌وفێڵ؛ وردەکاریگەلی پێویست بۆ

بەڕێوەبردنی کارێک.

**فوتون** / foton /: [انگلیسی] ☜ **فُتُون**

**فوتـه** / fûte ، ـها/: [معرب از کـردی]/سـم. فۆتـه؛ فۆتک؛ بەربالاڤ؛ پێشگیره؛ پارچەی تایبـەت بـۆ بە خۆدا دان زۆرتر لە گەرماو و زۆرخانەدا: **فوطه**

**فوتینـا** / fûteynā /: صـوت. [گفتـاری] هـەوک؛ وشەیێ کە منداڵان بۆ تیز پێ‌کردن یان بەرتەک دانەوە لە وەرامی هاوتەمەنانیان دەیلێن ‹فوتینا! اگر توانستی بیا بگیرا: هەوک! ئەی نایگری!؟›.

**فوج** / fo:c, fowc ، ـها؛ افواج/: [عربی]/سم. پـۆل؛ دەستە؛ گـرۆ؛ گـەل؛ چـین؛ ڕەپـەڵ؛ بەتایبـەت دەستەیەک لە خەڵک.

**فـوراً** / fo:ran, fowran /: [عربـی] قیـد. لـەجێ؛ گورجێ؛ دەس‌بەجێ؛ دەست‌بەجێ؛ جێ‌بـەجێ؛ هەرلەجێ؛ دەستەولەجێ؛ جێڤەرجێ؛ جاوەجـا؛ جاوەرجـا؛ گـورج؛ کـرژ؛ ژدەم؛ دەمودەسـت؛ دەمودەس؛ لـەدەما؛ لـە دەمـدا؛ لـەزکی؛ بێ‌درەنگ؛ فەورەن؛ هادر؛ هـادری؛ هەرئیسـتە؛ هەئیسـتە؛ هـەنهو؛ ڕێـورا؛ دگاویـدا؛ هـەرنهۆ؛ حادری؛ هەمما؛ بەبێ فەوتانی کات.

**فـوران** / favarān ، ـها/: [عربی]/سم. فیچقـە؛ فیشـقە؛ بازرەقـە؛ فـوویر؛ چۆنیـەتی جۆشـیان؛ جۆشـان؛ قوڵـین؛ هەڵقوڵـین؛ هەڵقوڵـتان؛ هەڵقوڵـتیان؛ فوویریـان؛ هلاویـتن؛ گاڤـە؛ لـە کونێکەوە بە نهێم هاتنە سەری تراو.

**فورانی** / favarānî /: [عربی] صفت. بازرەقـەیی؛ تایبەتمەندی شتێ کە بتوانـێ بـە تـەوژم بێتـە دەرێ.

**فورترن** / fortran /: [انگلیسی] ☜ **فُرتِرَن**

**فورم** / form /: [فرانسوی] ☜ **فُرم**

**فورمالیته** / formālîte /: [فرانسوی] ☜ **فُرمالیته**

**فورمول** / formûl /: [فرانسوی] ☜ **فُرمول**

**فورمیکا** / formîkā /: [انگلیسی] ☜ **فُرمیکا**

**فوروارد** / forvārd /: [انگلیسی] ☜ **فُروارد**

**فـوری**[1] / fo:rî, fowrî /: [عربـی] صفت. کـرژ: ١. گـورج؛ ئـازا؛ یەکاویـەک؛ دەسـبەجێ؛ گەرماوگەرم؛ بە تایبەتمەندی زوو بە زوویی ‹کار فوری: کاری گورج› ٢. بێ‌نیـاز بـە کـاتی زۆر بـۆ ئامادە بوون ‹چسب فوری: چەسپی کرژ›.

**فوری**[2]: قید. بـەپەلـە؛ گـورج؛ کـرژ؛ ئـازا؛ قیـپ؛ دەفی؛ بلەز ‹فوری رفت یک لیوان آب آورد: بەپەلە ڕۆی و پەرداخێ ئاوی هێنا›.

**فوریـت** / fo:rîyyat, fowrîyyat ، ـها/: [عربی] /سم. گورجوگۆڵی؛ بار و دۆخێ کە پێویسـتی بـە هەوڵدانی بە پەلەیە.

**فوریـه** / fevrîye /: [فرانسـوی]/سـم. فیوریيـە؛ شوبات؛ دووهەمین مانگی زایـینی کـە ٢٨ ڕۆژە (لـەساڵـی کەبیسـەدا ٢٩ ڕۆژ) و لـە دوازدەی ڕێبەندانەوە دەس پێدەکا.

**فوطه** / fûte /: [معرب از کردی] ☜ **فوته**

**فوفـل** / fûfel ، ـها/:/سم. فووفـل: ١. دارێکـی جوانە بە ساقەتەی بڵیند و لقی کورت و گـەڵای پانەوە، چێوەکەی بـۆ نـازک‌کـاری بـە کـار دێ ٢. تـۆمی بـەری داری فووفـل کـە درشـت، هێلکەیی، خورمایی و لەخۆگری ئالکالۆئیدە.

**فـوق** / fo:q, fowq /: [عربـی] صـفت. [مخفـف] سەرەوە؛ سەروو؛ نـاوبراو ‹کتـاب فـوق از انگلیسی ترجمه شده است: کتـێبی سـەرەوە لـە ئینگلیزیـەوە وەرگێڕدراوە›.

**فوق** / fo:qe, fowqe ، ـها/: حـرف. ژوور؛ ژووری؛ ژووروویی؛ لە سەرووی ‹فوق بنفش: ژوور بنەوش›.

▣ **فوق برنامه**: زیـاد لـە بەرنامـە؛ زێدەسـەری بەرنامە؛ زۆرتر لەوەی لە بەرنامەدا ڕەچاوکراوە ‹تلاش فوق برنامه: تێکۆشانی زیاد لە بەرنامە›.

**فوق بنفش** ☜ **فرابنفش**

**فوق تصوّر**: لـە سـەرووی خـەیاڵ؛ ژوورتـر و سەرتر لەوەی بیری بۆ بچێ.

**فوق دیپلم**: ژوور دیپلۆم؛ کارزانی.

**فوق لیسانس**: ژور لیسانس؛ کارناسی بالادەس.

**فوق‌الذکر** / fowqozzekr, fo:q- /: [عربی] صفت.

ناوبراو؛ سەرەوە؛ سەرۆ؛ ئاماژە پێ‌کراو لە سەرەوە ‹در کتاب فوق‌الذکر چنین نوشته شده است: لە کتێبی ناوبراودا ئاوا نووسراوە›.

**فـــوق‌العـــاده**[1] / fowqol'āde, fo:qol'āde, / fo:qal'āde/: [عربی]/*سم.* سەربەشانە؛ پارەیێ کـە جگە لـە مز، لـە بەرامبـەر کـارێکی تایبەتـەوە دەدرێ ‹فوق‌العادەی خارج از مرکز: سەربەشانەی نەبوون لە پاتەخت›.

**فوق‌العاده**[2]: *صفت.* یەکجار زۆر؛ ئێجگار زۆر؛ زۆر زۆر؛ یـەکجار؛ فـراوان ‹ثـروت فـوق‌العـاده: دارایـی یەکجار زۆر›.

**فوق‌العاده**[3]: *قیـد.* یەکجار؛ لە ڕادەبـەر؛ گەلـەک؛ ئێجگار؛ فرە؛ زۆر؛ بێ‌شۆ ‹فوق‌العاده خوشـحال بـود: یەکجار خۆشحاڵ بوو›.

**فوقـــانی** / fo:qānî, fowqānî/: [عربـی] *صـفت.* ســەروو؛ ژووروو؛ ژوورگ؛ ســەرین؛ ســەرگین؛ سەرگ؛ بانگین؛ جافگین ‹طبقەی فوقانی: نهـۆمی سەروو›.

**فول** / fowl, fol/: [انگلیسـی]/*سم.*/*[ورزش]* فـۆل؛ فەول؛ هەڵە؛ خەتا.

**فول** / fûl/: [انگلیسی] *صفت.* پڕ؛ پەڕ؛ تژی.

**فولاد** / fûlād/:/*سم.* پۆلا؛ پوولا؛ پەرەندا؛ پـۆلاد؛ چلک؛ ئالیاژی ڕەق و چەکوشـخۆری ئاسـن بـە ڕێژەیەکی کەمی کەربونەوە.

**فولادی**[1] / fûlādî/:/*سم.* پۆلایی؛ ڕەنگی نوقرەیی مات.

**فولادی**[2]: *صفت.* پـۆلایی: ۱. پـۆلایین؛ لـە پـۆلا ‹چاقوی فولادی: چەقۆی پـۆلایین› ۲. لـە ڕەنگـی پۆلا؛ بە ڕەنگی زێوی مات.

**فولادین** / fûlādîn/: *صفت.* پۆلاینە: ۱. پۆلایین؛ پوولادین؛ چێ‌کراو لـە پـۆلا ۲.*[مجازی]* نەبـەز؛ خۆڕاگر؛ وەک پۆلا.

**فولکلور** / folk(e)lor/: [فرانسوی] ☜ **فُلکلور**

**فولکلوریـــک** / folk(e)lorîk/: [فرانســوی] ☜ **فُلکلوریک**

**فولیکـــول** / folîkûl ، ـهـا/: [فرانسـوی]/*سـم.* فولیکوول: ۱.*[زیست شناسی]* توورەکـە ئاسـایەک بریتی لە چەند خان کە لە هێکدانی گواندارانـدا بـەدی دێ و جێگـەی گـوورانی هێلکۆکەیـە ۲.*[زیست‌شناسی]* کۆمەڵە خانـەی دەورانـدەوری بنی موو ۳.*[گیاه‌شناسی]* میوەی وشک و شکۆفای لە یـەک بەرچـە (خـرزک) پێکهـاتوو، کـە دوای پێگەیشتن، بە باری درێژیدا دەپشکوێ.

▣ **فولیکول گراف**: کڵۆی وردی نێو هێکدان کە هەر کام هێلکۆکەیەکیان هەیە.

**فــوم** / fom/: [انگلیسـی]/*سـم.* فـووم؛ چەشـنێک ماکی پلاستیکی سۆکی وەک هەوری پفکراو کە لە پیشەسازیدا کەڵکی لێ وەردەگرن.

**فونتیک**[1] / fonetîk/: [فرانسـوی]/*سم.* فونیتیـک؛ دەنگ‌ناسی.

**فونتیک**[2]: *صفت.* فونتیکی؛ دەنگ‌ناسانە.

**فونتیکی** / fonetîkî/: [فرانسوی] *صفت.* فـونتیکی؛ پێوەندیدار یان سـەر بـە دەنگـە سـەرزاریەکانی وشەگەلی زمانێک.

**فونداســـیون** / fondāsiyûn/: [فرانســـوی] ☜ **فنداسیون**

**فونم** / fonem/: [فرانسوی] ☜ **واج**

**فونمیک** / fonemîk/: [فرانسوی] ☜ **واج‌شناسی**

**فوویســم** / fovîsm/: [فرانسـوی]/*سـم.* فوڤیسـم؛ ڕاپەڕینێک لە هـونـەری نیگارکێشـیدا، کـە لـە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بـە هـۆی هـانری مـــاتیس (۱۸٦۹ـ۱۹۵٤ ز.) نیگارکێشـــی فەڕانسەویەوە سەری هەڵدا و تایبەتمەندیەکانی بریتی بوون لە: ڕەنگـی زەق و تونـد، تێکـدانی ئەندازە و بیچمی ئاسایی و بزوانـدنی هەسـت و زیچی دەم و دەستی مرۆڤ.

**فهارس** / fahāres/: [عربی] جمعِ ☜ **فهرست**

**فهرست** / fehrest ، ـها؛ فهارس/: [معـرب از پهلـوی] /*سم.* پێڕسـت؛ پێرسـت؛ فیهرسـت؛ فێرسـت: ۱. نووسراوەیێ بریتی لە زانیاری تایبەت لەمـەڕ

ئەندامانی کۆمەڵێکەوە ‹فهرست اسامی: پێرستی ناو› ٢. نووسراوەیێ کە کتێب و بلاڤۆکی شوێن یان بابەتێکی تێدا هاتووە ‹فهرست کتابهای زیست‌شناسی: پێرستی کتێبگەلی ژین‌ناسی›.

▣ **فهرست اعلام**: ناونامە؛ پێرستی ناوان؛ پێرستی ناوگەلی تایبەت (کەسان، شوێنگەل، کتێبگەل و...) کە بە گوێرەی پیتی ئەلفوبێ ڕێزکراون.

**فهرست الفبایی**: پێرستی ئەلفوبێتکەیی؛ پێرستێ کە بە ڕیزی ئەلفوبێ ڕیزکراوە.

**فهرست انتشارات**: پێرستی پەخشانگە؛ پێرستی ئەوەی لە لایەن دامەزراوەیەکەوە دەرچووە.

**فهرست راهنما**: پێرستی ڕێنوین؛ پێرستی ئەوەی لە کتێبێکدا ناوی براوە.

**فهرست کتاب**: پێرستی پەرتووک؛ پێرستی بابەت یان بەشگەلی کتێب، بە ژمارەی لاپەڕەیانەوە.

**فهرست مأخذها/ منابع**: پێرستی سەرچاوەکان؛ پێرستی ئەو نووسراوانە کە نووسەر کەڵکی لێوەرگرتوون.

**فهرست موضوعی**: پێرستی بابەتی؛ پێرستێ کە بە گوێرەی بابەت ڕیزکراوە.

▣ **فهرست کردن**: پێرست‌کردن؛ نووسین و ئامادە کردنی پێرست. هەروەها: **فهرست شدن**

**فهرست‌نویسی** / fehrestnevîsî ، ـها/: [معرب/ فارسی]/اسم. پێرستنووسی؛ کار و ڕەوتی نووسینی ناو و تایبەتمەندیگەلی ئەندامانی کۆمەڵەیەک (کتێب، وتار و...).

**فهرست وار** / fehrestvār/: [معرب/ فارسی]قید. پێرستی؛ بە شێوەی فێرست نووسین؛ فێرست‌ئاسا: *الف)* بە کورتی؛ پوختە *ب)* بە ڕیزی ئەلفوبێتکە یان ژمارەوە.

**فهلویات** / fahlavîyyāt/: [عربی]/اسم. ستران و دووبەیتی بە زاراوەی ناوچەیی.

**فهم** / fahm/: [عربی]/اسم. ئاوەز؛ ئاوز؛ فام؛ فەهم؛ فێم؛ دەرک؛ هۆش؛ سەرەدەر؛ سەرودەر؛ سەرودەروو: ١. لێهاتوویی بیر و زەین بۆ زانین ٢. هێز و توانستی تێگەیشتن.

**فهماندن** / fahmāndan/: [عربی/ فارسی] مصدر. متعدی. // **فهماندی**: فاماندت؛ **می‌فهمانی**: دەفامێنی؛ **بفهمان**: بفامێنە// (پێ)فاماندن؛ گەشتاندن؛ تێگەیاندن؛ حاڵی کردن؛ ڤەپێچرین؛ دانسەح کرن ‹به او فهماندم که دیگر برایش کار نخواهم کرد: پێم فاماند چیدی کاری بۆ ناکەم›. هەروەها: **فهماندنی**

■ مصدر منفی: **نفهماندن** (نەفاماندن)

**فهمیدن** / fahmîdan/: [عربی/ فارسی] مصدر. لازم // **فهمیدی**: تێگەیشتی؛ **می‌فهمی**: تێدەگەی؛ **بفهم**: تێبگە// تێگەیشتن؛ زانین؛ حاڵی بوون؛ تێگەین؛ گەشتن؛ پەی بردن؛ ئاوزان؛ ئاوزیان؛ ئاوەزیەی؛ ئاوەزیان؛ ئاوزین؛ فامین؛ فەمسن؛ فامەی؛ فامای؛ سەر لێدەرچوون؛ سەر لێدەرکردن: ١. تێگەیین لە کاکڵە و ناوەرۆکی پەیامێک ‹حرفش را فهمیدم: قسەکەی تێگەیشتم› ٢. لەمەڕ بابەتێکەوە زانیاری باش وەچنگ خستن ‹فهمیدم چطور درس می‌خواند: حاڵی بووم چۆن دەرس دەخوێنێ› ٣. هەڵینجان؛ هەلکڕاندن؛ گرد و کۆ کردن یان داوەری‌کردن لەمەڕ شتێکەوە ‹از رفتارش این طور فهمیدم که آمادەی رفتن است: لە هەڵس‌وکەوتی وا تێگەیشتم کە تەیاری چوونە›. هەروەها: **فهمیدنی**

■ صفت مفعولی: **فهمیده** (تێگەیشتوو)/ مصدر منفی: **نفهمیدن** (تێنەگەیشتن)

**فهمیده** / fahmîde ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. تێگەیشتوو؛ تێگەییو؛ دەگەر؛ تێەیشتی؛ فامیدە؛ فاما؛ فامی؛ دانا؛ زانا؛ فامیە؛ بە ئاوەز؛ حاڵی؛ بە زانست؛ ساڵۆر؛ ژیر ‹یک آدم فهمیده بفرست که بتواند حرف بزند: کەسێکی تێگەیشتوو بنێرە بتوانێ قسە بکا›.

**فهیم** / fahîm/: [عربی] *صفت. [ادبی]* فامیده؛ تێگەیشتوو؛ خاوەن‌فام.

**فی** / fî/: [عربی] *اسم. [بازرگانی]* نرخ؛ بەها؛ بایی؛ ئەرزش؛ قیمەت.

◙ **فی زدن**: ناو نیان؛ قیمەت لێ‌دان؛ قیمەت دانان؛ دانانی نرخی شتێ ‹گفتم بیاید قالی‌ها را فی بزند: گوتم با بێت قالیەکان ناو بنێ›.

**فیاض** / fayyāz/: [عربی] *صفت. [ادبی]* خێردەر؛ سوودگەیێن؛ سوودهێنەر ‹منبع فیاض: چاوکەی خێردەر›.

**فی‌الجمله** / felcomle, feccomle/: [عربی] *قید. [ادبی]* بەکورتی؛ خولاسەی کەلام ‹فی‌الجمله اعتماد مکن بر ثبات دهر: بەکورتی دڵت خۆش مەکە بە دنیا›.

**فی‌الفور** / felfo:r, felfowr/: [عربی] *قید. [ادبی]* خێرا؛ گورج؛ ئازا؛ کرژ؛ بێ‌درەنگ ‹فی‌الفور رفت و همراه پسرش برگشت: خێرا چوو و لەگەڵ کوڕەکەی هاتەوە›.

**فی المثل** / felmasal/: [عربی] *قید. [ادبی]* بۆ وێنە؛ وەکوو ‹فی‌المثل فردا چو دیدی کار سامان یافته: بۆ وێنە هاتوو بەیانی کارەکان کەوتنە سەر بار›.

**فی المجلس** / felmacles/: [عربی] *قید.* هەرلەجێ؛ لە ئەو مەجلیسەدا؛ لەو جێگا و لەو کاتەدا ‹آمد و فی‌المجلس کار را تمام کردیم: هات و هەرلەجێ کارەکەمان بڕیەوە›.

**فی‌الواقع** / felvāqe'/: [عربی] *قید. [ادبی]* بەڕاستی؛ لە ڕاستیدا ‹فی‌الواقع جای زیبایی بود: بەڕاستی جێگایکی جوان بوو›.

**فیبر** / fîbr/: [فرانسوی] *اسم.* فیبر: ١. تەختەی ناسکی دروست‌کراو لە وردە چێو و چەسپ ٢. ریش؛ ریشان؛ ریس؛ هەموو جۆرە ڕیشاڵەیەک کە لە پیشەسازی، بەتایبەت هەوداچنیدا بە کار دەچێ.

◙ **فیبر شیشه**: فایبرگلاس.

**فیبر نوری**: فیبری نووری؛ ڕیشاڵی ناسک و ڕۆشنی شیشە یان پەلاستیک کە نووریان لێوە تێپەڕ دەبێ، لە ئامرازی بژیشکی بۆ دیتنی ناوەوەی لەش و هەروەها کەرەستەی تەلەفوون و تەلەگراف بە کار دەچێ.

**فیبروز** / fîbrûz/: [فرانسوی] *اسم. [پزشکی]* ڕەوتی پێکهاتنی شانەگەلی لیفی لە ئەندامێکدا.

**فیتوپلانکتون** / fîtop(e)lānkton ، ـها/: *اسم. [زیست‌شناسی]* فیتۆپلانکتون؛ گیایەکی ئاوژی لە تیرەی قەوزەی میکرۆسکۆپی، کە لە ناوچەگەلی ڕوونی دەریادا دەژی.

**فیجوآ** / fîcû'ā ، ـها/: *اسم.* فیجوئا: ١. جۆرێک دارە مۆردی ناوچەی ئەمریکای باشووری بە بەرزایی ٥ میترەوە ٢. بەری ئەو دارە کە خڕ و سەوزە، بە ئەندازەی هێلکەیەک دەبێ و دەخورێ.

**فی‌حدذاته** / fîhaddezāte(h)/: [عربی] *قید. [ادبی]* بۆ خۆی؛ لە ڕادەی خۆیدا؛ بەش بە حاڵی خۆی؛ پەی وێش ‹فی‌حدذاته آدم بدی نیست: بۆ خۆی پیاوێکی خراپ نیە›.

**فیدبک** / fîdbak ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* ١. ڕەوتی هەڵگەڕاندنەوەی بەشێک لە بەرهەمی دەرهاتووی دەزگایەک بەرەو دوا و بۆ بەشی سەرەتاییەکەی ٢. ڕاسپێری ‹آقای اعلم در مورد موضوع سخنرانی فیدبک خوبی به من داد: ئاغای ئەعلەم لەمەڕ بابەتی وتارەکەوە راسپێریەکی باشی کردم›.

**فیروز** / fîrûz/: *صفت. [نامتداول]* سەرکەوتوو؛ سەرکەوتە؛ سەرکەتی.

**فیروزمند** / fîrûzmand ، ـان/: *صفت. [نامتداول]* سەرکەوتوانە.

**فیروزه** / fîrûze ، ـها/: *اسم.* پیرۆزە؛ پیرووزە؛ فرووزی؛ بەردێکی ئاسمانی ڕەنگی بە نرخە.

**فیروزه‌ای**[1] / fîrûze'î/: *اسم.* پیرووزەیی؛ ڕەنگی ئاسمان؛ شینی پڕڕەنگ.

**فیروزەای**[٢]: *صفت.* پیرۆزەیی؛ پیرووزەیین؛ بە ڕەنگی شینی ئاسمانی.

**فیروزەفام** / fîrûzefām/: *صفت.* فیرووزەڕەنگ؛ پیرۆزەڕەنگ؛ بە ڕەنگی پیرۆزە. هەروەها: **فیروزەرنگ**

**فیروزی** / fîrûzî ، ـها/: *اسم. [نامتداول]* کار و ڕەوتی سەرکەوتن؛ بردنەوە.

**فیزیک** / fîzîk/: [فرانسوی] /*اسم.* فیزیک؛ فیزیا: ١. زانستی ماک و وزە و لێککردیان لە بواری میکانیک، دەنگ، تیشک، گەرما، میگناتیس، کارەبا، تاو، پێکهاتەی ئەتوم و دیاردەی ناوەکەیەوە ٢. کار و ڕەوت و دیاردەگەلی ئاسایی دەزگا یان تەنێک.

◙ **فیزیک اتمی/ هستەای**: فیزیکی ئەتومی/ ناوکەیی؛ زانستی لێکۆڵینەوەی ناوکەی ئەتۆم، گەردیلە بناخەییەکان و کاردانەوەگەلی ناوکەیی.

**فیزیکدان** / fîzîkdān ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] /*اسم.* فیزیازان؛ پسپۆڕی فیزیک؛ ئەوەی لە زانستی فیزیکدا مامۆستایە.

**فیزیکی** / fîzîkî/: [فرانسوی] *صفت.* فیزیکی؛ فیزیایی: ١. سەر بە فیزیک ‹آزمایش فیزیکی: تاقی کردنەوەی فیزیکی› ٢. سروشتی ‹جهان فیزیکی: دنیای سروشتی› ٣. جەستەیی؛ لەشی ‹کار فیزیکی: کاری جەستەیی›.

**فیزیوتراپی** / fîz(i)yot(e)rāpî/: [فرانسوی] /*اسم. [پزشکی]* فیزیۆتراپی؛ کاری دەرمانی نەخۆشی و لاوازی یان کەمایەسی جەستەیی لە ڕێگەی بزواندن و جووڵاندنی فیزیکی (وەک شێلان، ژیمناستیک و شتی واوە) و بە یارمەتی کەرەستەی تایبەتەوە.

**فیزیوتراپیست** / fîz(i)yot(e)rapîst ، ـها/: [فرانسوی] /*اسم. [پزشکی]* فیزیۆتراپیست؛ کەسێ کە بە شێوەی فیزیۆتراپی نەخۆش دەرمان دەکا.

**فیزیوکرات** / fîz(i)yok(e)rāt ، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* فیزیۆکرات؛ لایەنگری ڕێبازی فیزیۆکراسی.

**فیزیوکراسی** / fîz(i)yok(e)rāsî/: [فرانسوی] /*اسم.* فیزیۆکراسی؛ ڕێبازێکی ئابووری ــ رامیاری کە لە چەرخی هەژدەهەم لە فەڕانسەدا سەری هەڵدا و دەڵێ دەوڵەت نابێ دەست بەرێتە نێو قانوونگەلی ئاسایی ئابووریەوە و هەروەها زەوین سەرچاوەی سەرەکی داراییە.

**فیزیولوژی** / fîz(i)yolojî/: [فرانسوی] /*اسم.* فیزیۆلۆژی؛ زانستی ئەرکی ئەندامان؛ لقێک لە زانستی ژیناسی کە لە سەر ڕەوت و کارکردی کۆئەندامان (ئەندام، شانە و خان) و دیاردەگەلی کیمیایی و فیزیکیانەوە دەکۆڵێتەوە.

◙ **فیزیولوژی روانی**: لقێک لە زانستی دەروونناسی ئەزموونی کە لە سەر پێوەندیەکانی لەش و دەروون دەکۆڵێتەوە. هەروەها: **فیزیولوژی انسانی؛ فیزیولوژی جانوری؛ فیزیولوژی گیاهی**

**فیزیولوژیک** / fîz(i)yolojîk/: [فرانسوی] *صفت.* فیزیۆلۆژیک؛ سەر بە فیزیۆلۆژی.

**فیزیولوژیکی** / fîz(i)yolojîkî/: [فرانسوی] *صفت.* فیزیۆلۆژیکی؛ سەبارەت بە فیزیۆلۆژی.

**فیس** / fîs ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* فیز؛ دەمار؛ دەعیە؛ عینوان؛ فیس؛ فیسە؛ ملق؛ خوس؛ بۆج؛ ئاکارێ کە لە خۆبەزلزانیەوە هەڵدەستێ.

**فیستول** / fîstûl/: [فرانسوی] /*اسم. [پزشکی]* ناسۆر؛ دۆخ یان ڕەوتی بەدیهاتنی دەراوێکی نائاسایی لە نێوان کوان یان کلۆرێکی نێو لەش لەگەڵ دەرەوەی پێستدا.

**فیسو** / fîsû ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* فیزن؛ فیسن؛ بە دەمار؛ لووتبەرز؛ ترزل؛ بادی هەوا؛ فیزدار؛ حالۆر؛ حالۆر؛ قاپان؛ کاو؛ برووغ؛ ترتۆپ؛ دفرە؛ گیف؛ دفنبلند؛ خۆ بە زل زان.

**فیش** / fîš ، ـها/: [فرانسوی] /*اسم.* فیش: ١. پەڕە؛ بەرگە؛ لاپەڕە؛ پارچە کاغەز یان مقەبای بۆ لە

سەر نووسین ۲. دڤانەک؛ لاپەڕەی چاپی ‹فیش حقوقی: فیشی مووچە› ۳. میلەیەکی کانزایی لکاو بە چەند تاڵ سیمەوە، بۆ لکاندنی دوو خولگە یان پاژگەلی دەزگایەکی کارەبایی پێکەوە.

▣ **فیش برداشتن:** فیش هەڵگرتن؛ لە سەر چاوەیەک (وەک فەرهەنگ، کتێبی مێژوو، پەرتووکی مێژوویی و...) بۆ کۆکردنەوەی ئەو زانیاریانەی وا پێویستە، لە سەر پارچە کاغەزێکی سپی، یادداشت هەڵگرتن.

**فیش نوشتن:** فیش هەڵگرتن؛ فیش نووسین؛ نوسینی بابەتی پێویست لە سەر فیش.

**فیش‌برداری** / fîšbardārî ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. فیش‌هەڵگری؛ کار و ڕەوتی فیش هەڵگرتن؛ گۆزانەوەی بابەت و زانیاری پێویست بۆ سەر فیش.

**فیش‌نویسی** / fîšnevîsî ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. فیش‌نووسی؛ کار و ڕەوتی فیش هەڵگرتن؛ نووسینی بیرەوەری و زانیاری پێویست لە سەر فیش.

**فیشیه** / fîšîye ، ـها/:[فرانسوی]/اسم. فیشدان؛ بەرگەدان؛ پەڕەدان؛ جێگای بەڵگە؛ سندووق یان ڕفەی تایبەت بۆ چنین و بەڕیز دانانی فیش.

**فیصل** / feysal/: [عربی] ☜ **فیصله**

**فیصله** / feysale/: [عربی]/اسم. کار یان ڕەوتی بڕانەوە؛ بڕیانەوە؛ لەکۆڵ‌بوونەوە؛ دوایی هاتنی ڕووداوێکی ناخۆش: **فیصل**

▣ **فیصله دادن:** بڕینەوە؛ بڕیەیوە؛ لەکۆڵ کردنەوە؛ ئەوەبڕیەی؛ دوایی/ کوتایی هێنان بە کارەساتێک ‹قاضی به اختلاف زن و شوهر فیصله داد: داوەر کارەساتی ناکۆکی ژن و مێردەکەی بڕیەوە›. هەروەها: **فیصله یافتن**

**فیض** / feyz ، ـها؛ فُیوض؛ فُیوضات/: [عربی]/اسم. قازانج؛ بەهرە؛ کەڵک؛ هۆ؛ هوو؛ سوود (بەتایبەت لە بواری مەعنەویەوە).

▣ **فیض بردن:** بەهرە/ قازانج بردن؛ سوود/ کەڵک وەرگرتن.

**به فیض رسیدن:** گەیشتن بە قازانج/ سوود؛ بەهرەمەند بوون. هەروەها: **به فیض رساندن**

**فیکس** / fîks/: [فرانسوی] *صفت*. ڕاست؛ وەستۆک؛ بێ‌کەم و زیاد ‹فیکس هزار تومان: ڕاست هەزار تمەن›. هەروەها: **فیکس بودن؛ فیکس شدن؛ فیکس کردن**

**فیکساتور** / fîksātor ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پژێنە؛ فیکساتۆر؛ کەرەستەی پژێنەری بڕێ تراوی وەک ڕەنگ.

**فیگور** / fîgûr ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ملق؛ فیگوڕ؛ بیچم و شێوەی لەشی کەسێک لە کاتی کردنی کارێکی تایبەتیدا ‹فیگور کار؛ فیگور ورزشی: ملقی کار؛ فیگوری وەرزشی›.

**فیگوراتیو** / fîgûrātîv/: *صفت*. نواندنی؛ بە بیچم و شێوەیەکی شیاوی نواندن.

**فیل** / fîl ، ـها/: [معرب از هندی]/اسم. فیل؛ فێڵ: ۱. ئاژەڵی گوانداری ئالفخۆر بە پێستی بێ‌تووکی ئەستوور، کەپۆی درێژی لوولەئاسا، دوو ددانی کەلبی درێژ کە عاجی ناوە و لە ڕەگەزی ئەفریقاییدا، دوو گوێی زلی باوەشێنیەوە ۲. لە مۆرەگەلی گەمەی شەترەنج کە لار دەڕوا و هەر لایەنێک دوودانەی هەیە.

▣ **فیل شاه:** فیل‌شا؛ فیلێ کە لە گەمەی شەترەنجدا لە پەنای شادایە. هەروەها: **فیل وزیر**

▣ **فیل کسی یاد هندوستان کردن:** *[کنایی]* کەڵکەڵە لە سەردانەوە؛ دیسانەوە حەز و ئارەزوویەکی کۆن سەرهەڵدانەوە ‹باز فیلش یاد هندوستان کرده و می‌خواهد برگردد آمریکا: دیسانەکە کەڵکەڵە لە سەری داوەتەوە و دیهەوێ بگەڕێتەوە بۆ ئەمریکا›.

**فیل هوا کردن:** *[کنایی]* گامێش بە کونەباندا سەر خستن؛ لە سەر ئاو ئاور کردنەوە؛

کارێکی سەرسوورێنەرکردن؛ ‹چرا جمع شده‌اید؟ مگر دارند فیل هوا می‌کنند؟: لە چی کۆ بوونەتـەوە؟ خەریکن گامیش بە کونەباندا سەر دەخەن؟›.

**فیلاریـــا** / fîlāryā/: [فرانسـوی]/اسـم. فیلاریـا؛ کرمێکی لامژی ناوچەی گەرمێنـە کـە لـە نێـو شـانەی لەشـی گوانداراننـدا دەژی و گـەرای بڕێکیان دەڕژێتە نـاو خوێنـەوە و دەبێتـە هـۆی نەخۆشی فیلاریۆز.

**فیلاریـوز** / fîlāryoz/: [فرانسـوی]/اسـم. [پزشکی] فیلاریۆز؛ تووشی نەخۆشـی چەشـنێک فیلاریـا بوون.

**فیلامان** / fîlāmān ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. فیلامان؛ ڕیسە یان تەلی نێو لامپ کە بە تێپەڕینی کارەبا گەرم دەبێ و تیشک دەداتەوە.

**فیلبان** / fîlbān ، ـهـا؛ ـان/: [معـرب/ فارسـی]/اسـم. فیلەوان؛ فیلْوان؛ ئەوی کاری ڕاگرتن و ئاگاداری لە فیلە.

**فیلپا** / fîlpā ، ـها/: [معرب/ فارسـی]/اسـم. [معمـاری] فیلْپا؛ کۆڵەکەیەکی ئەستوور لە ناوکاری دیواردا بۆ پتەو بوون و خۆڕاگری زۆرتری دیوار.

**فیلتـر** / fîlter ، ـهـا/: [انگلیسـی]/اسـم. ١. پالْـوانە؛ پالْوێنە؛ پەرزوانە؛ سافۆ؛ پـادزن؛ سـافی؛ پـارزن؛ ڕاوەک؛ ڕاوک؛ کاغەز و تۆڕی تایبەت بۆ پالاوتن ٢. ئەغزە؛ ئـاغزە؛ قونچکـە سـیغار؛ هەورئاسـای دەکاغەز پێچراوی بـن جغـارە ٣. فیلتـر؛ کـار و ڕەوتی بەرگری‌کردن لە گەیشتنی باسی هـەواڵ و ڕووداوان بە خەڵک لە ڕێگای ئینترنتەوە.

**فیلدمارشال** / fîldmāršāl ، ـها/: [فرانسـوی]/اسـم. ئەرتەشبود؛ بانترین پلەی چەکداری.

**فیلر** / fîler ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. فیلر: ١. پرکـەر؛ ماکێکی کەم‌بایەخ و بێ‌مەترسی بـۆ زۆر یـان خەسـتـکردنـەوەی مـاکی سـەرەکی ٢. کەرەسەیەک لە چەن تێخەی کانزایی ناسک بە ئەستوورایی جۆراوجۆرەوە بۆ میزان‌کـردن و ڕێکخستنی سووپاپ و مەودای نێوان دوو سەری پلاتین لە موتوردا.

**فیلسوف** / fîslûf ، ـها؛ ـان؛ فلاسفه/: [معرب از یونانی] /اسم. پیتـۆڵ؛ فەیلەسـووف: ١. ئـەوی بناغـەی فەلسەفەیەکی داناوە ٢. ئەوەی لە فەلسەفە باش تێدەگا و ڕاڤەی دەکا.

**فیلسـوفانه**[١] / fîlsûfāne/: [معـرب/ فارسـی] صفت. پیتۆڵانە؛ فەیلەسووفانە؛ سـەر بـە فەیلەسـووفان ‹افکار فیلسوفانه: بیروڕای پیتۆڵانە›.

**فیلسوفانه**[٢]: قید. فەیلەسووفانە؛ پیتۆڵانـە؛ وەکـوو فەیلەسـووفان ‹فیلسـوفانه سـری تکـان داد: فەیلەسووفانە سەرێکی لەقاند›.

**فیلگـــوش** / fîlgûš/: [معـــرب/ فارســـی] ☜ **گوش‌فیل-٢**

**فـیلم** / fîlm ، ـهـا/: [فرانسـوی]/اسـم. ١. فـیلم؛ پەڕەیەکی نەرم و ڕوون لە جنسی ئەسیتات یان نیتـراتی سـیللولۆز، کـە ڕووەکـەی بـە تێکەڵاوەیەکی هەستۆک بە تیشک داپۆشـراوە و بۆ وێنە هەڵگرتن بە کار دێ ٢. فـیلم؛ زنجیـرە وێنەی تۆمارکراوی سەر شریتەیەک لەو جنسـە کە لە کاتی ڕوانیندا وەکوو وێنەیەکی بزێو دێتـە بەرچاو ٣. تۆژ؛ تـۆژاڵ؛ تـۆ؛ سـەرتۆ؛ تـۆخ؛ کـاژ؛ پەڕەی زۆر ناسکی سەر شت.

▣ **فیلم آموزشی**: فیلمی فێرکاری؛ فیلمێ کە بە مەبەسـتی فێرکـردنی شـتێک بـە بینـەران بەرهەم هاتبێ.

**فیلم پوزتیو**: فیلمێ کە وێنە و ڕەنگـی ڕێکـی بابەتەکەیەتی: **فیلم مثبت**

**فیلم تلویزیونی**: فیلمی تەلەڤـیزیونی؛ فیلمـێ کە بۆ بلاوکردنـەوە لـە تەلەڤـزیوندا دروسـت کرابێ. هەروەها: **فیلم سینمایی**

**فیلم خام**: فیلمی سـاکار؛ فیلمـێ کـە هێشـتا وەبەر تیشک نەخرابێ و هـیچ وێنەیـەکی لـە سەر نەبێ.

**فیلم رادیولوژی**: فیلمێ کە بۆ وێنە هەڵـگرتن بە تیشکی ئیکس بەکار دێ.

**فیلم رنگی:** فیلمی ڕەنگی: ١. فیلمێ کە لە پێکهاتەکەیدا چینی ڕەنگسازی دەکار کرابێ ٢. فیلمێ کە دیمەنەکان بە ڕەنگی ئاسایی خۆیان دەنوێنێ.

**فیلم صامت:** فیلمی کپ؛ فیلمی بێ‌دەنگ؛ فیلمێ کە هیچ دەنگێکی لە سەر تۆمار نەکرابێ. هەروەها: **فیلم ناطق**

**فیلم عروسکی:** فیلمی تەتەیی؛ فیلمێ کە قارەمانەکانی تەتە و وەویلەن و لەوانە فیلم هەلگیراوە.

**فیلم عشقی:** فیلمی دلّداری؛ فیلمێ کە داستانی بەسەرهاتێکی ئەویندارانەیە. هەروەها: **فیلم پلیسی؛ فیلم تاریخی؛ فیلم مذهبی**

**فیلم عکاسی:** فیلمی وێنەگری؛ فیلمێ کە بۆ وێنەهەلگرتن دروست‌کراوە.

**فیلم کارتون:** فیلمی کارتۆن؛ فیلمێ کە بابەتەکەی بە زنجیرە دیمەنێکی کێشراو دەرهاتبێ و لەوە فیلم هەلگیرابێ.

**فیلم کمدی:** فیلمی کۆمێدی؛ فیلمێ کە ناوەرۆکێکی پێکەنینی هەبێ. هەروەها: **فیلم تراژدی**

**فیلم مثبت** ☜ **فیلم پوزیتیو**

**فیلم مستند:** فیلمێ کە لە ڕووداو یان دیمەنێکی ڕاستەقینە هەلگیرابێ.

**فیلم منفی** ☜ **فیلم نگاتیو**

**فیلم نگاتیو:** فیلمێ کە وێنە و ڕەنگی بە پێچەوانەی بابەتەکەیەتی: **فیلم منفی**

▣ **فیلم آمدن:** *[گفتاری]* فیلم کایەکردن؛ خۆ لە شتێک دان؛ خۆ جۆرێکی ناڕاستەکی پێ‌کردن، بە مەبەستی گالتە، شوێن گوم کردن یان هەلخلەتاندنی خەلک ‹تو کە پول نداشتی، این فیلم آمدنت چە بود؟: ئەتۆ کە پارەت نەبوو، ئەم فیلم کایەکردنەت چ بوو؟›.

**فیلم برداشتن:** فیلم هەلگرتن ‹از آن مراسم فیلم برداشتند: لەو ڕێ‌وڕەسمە فیلمیان هەلگرت›.

**فیلم دادن:** فیلم دان؛ فیلم پیشان دان ‹فیلم گاندی را می‌دهد، برویم ببینیم: فیلمی گاندی دەدا با بڕۆین ببینین›.

**فیلم کردن:** *[مجازی]* فریو دان؛ خەلەتاندن؛ دەس‌بەسەرکردن ‹حضرت آقا همە را فیلم کردە بود: مامۆستا هەمووی فریو دابوو›.

**فیلم گرفتن:** فیلم‌گرتن؛ پێکهێنانی وێنە لە سەر فیلم ‹یک ربع ساعت فیلم گرفتەام: چارەکەسەعاتێک فیلمم گرتووە›.

**فیل‌ماهی** / fîlmāhî ، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] /اسم/ فیل‌ماسی؛ چەشنێک ماسی خاویار، وەکوو نقە کە دەمیان بە لای سکدایە و لە کرم و وردەماسی و گژ و گیای ئاوژی دەخۆن.

**فیلمبردار** / fîlmbardār ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم/ فیلمگر؛ فیلم‌هەلگر؛ کەسێ کە کاری تۆمارکردنی وێنەیە لە سەر فیلم، بە کامێرای تایبەت بەو کارە.

**فیلمبرداری** / fîlmbardārî ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم/ فیلم‌هەلگری: ١. کار و ڕەوتی تۆمارکردنی لەشوێن‌یەکی وێنەی دیمەن و ڕووداوان لە سەر فیلم بە خێراییەکی هێندێک سەرتر لە وزەی لێکدانەوەی چاو (٢٤ وێنە لە چرکەیەکدا) ٢. کار و ڕەوتی تۆمارکردنی دیمەن و ڕووداوان لە سەر شریتەی میگناتیسی (بۆ شاندانی تەلەڤیزیونی یان ڤیدیویی). هەروەها: **فیلمبرداری کردن**

**فیلمخانه** / fîlmxāne ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم/ فیلمخانە؛ شوێنێ کە کۆپیەک لە فیلمی سینەمایی تێدا هەلدەگرن.

**فیلمساز** / fîlmsāz ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم/ فیلمساز؛ کەسێ کە فیلم دروست کردن کاریەتی. هەروەها: **فیلمسازی**

**فیلمنامه** / fîlmnāme ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم/ فیلمنامە؛ چیرۆک یان نووسراوەیێ کە فیلمی

لێ دروست دەکەن.

**فیلمنامەنویس** / fîlmnāmenevîs ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. فیلمنامەنووس؛ کەسێ کە کاری نووسینی چیرۆک، گەلالە یان وتارێک بۆ بەرهەمهێنانی فیلمە. هەروەها: **فیلمنامەنویسی**

**فیل و فنجان** / fîl-o-fencān /: [معرب از هندی/ معرب از یونانی]/اسم. *[کنایی]* گۆزەلەی پای ژالە؛ گەز و جاوگ؛ دوو شت کە (زۆرتر لە باری ئەندازەوە) پێکەوە ناگونجێن و دژ بە یەکن.

**فیلولژی** / fîlolojî /: [فرانسوی]/اسم. زمانەوانی: ١. بەراورد و لێکدانەوەی وێژە و زاراوەی زمانێک بە پێی ئەو پەخشان و شیعرانە کە بەو زمانە نووسراون ٢. زمانناسی مێژوویی و بەراوردی * **فقه‌اللغه**

**فیله** / fîle /: [فرانسوی]/اسم. فیلە: ١. /ـها/ ولمە؛ گۆشتی لوخم و بێئێسقانی ئاژەڵ یان ماسی ٢. خۆراکێ کە لەو گۆشتە دروستی ئەکەن و پتر بە شێوەی کەباب یان سوورەوەکراوە.

**فیلی**[١] / fîlî /: [معرب]/اسم. بۆرەشین؛ ڕەنگی خۆڵەمێشی تۆزێک شینکار.

**فیلی**[٢]: صفت. فیلی؛ فێلی؛ بەڕەنگی فیل.

**فی‌مابین** / fîmābeyn /: [عربی] صفت. نێوان؛ لە نێوان ‹رابطه ی فی‌مابین تو و او: پێوەندی‌نێوان تۆ و ئەو›.

**فین** / fîn /: صوت. مف؛ فن؛ مش؛ فیشکە؛ لووش؛ شم؛ لم؛ فم؛ خم؛ هنگ؛ دەنگی لووت لە کاتی سڕیندا.

◘ **فین کردن**: فم‌کردن؛ هنگ‌کردن؛ مش/شم/خم کردن؛ لووش کەردەی؛ فن کردن؛ لووت سڕین؛ کەپۆ پاک کردنەوە لە چڵم.

**فینال**[١] / fînāl ، ـها /: [فرانسوی]/اسم. فینال؛ دواهەمین قۆناخی خولێکی کێبەرکێ یان ئەزموون.

◘ **پای فینال رسیدن**: گەیشتنە فینال؛ گەیشتن بە دواهەمین قۆناخی کێبەرکێ.

**فینال**[٢]: صفت. فینال؛ کۆتایی؛ دواقۆناغ.

**فینالیست** / fînālîst ، ـها: [فرانسوی]/اسم. فینالیست؛ ئەو کەسە کە گەیشتۆتە پای دواهەمین خولی کێبەرکێ.

**فی‌نفسه** / fînafse /: [عربی]قید. بۆ خۆ؛ بەش بە حاڵی خۆ؛ خۆ بە خۆ ‹من فی‌نفسه به این کار علاقه‌ای ندارم: من بۆخۆم خۆشم لەم کارە نایەت›.

**فینگیلی** / fîngîlî /: صفت. *[کودکانه]* خنجیلانە؛ چکۆلە؛ وردیلە؛ گولانە؛ بیچکۆلانە؛ بیچکۆلە؛ بیچکۆلێ؛ گچکە ‹یک توپ فینگیلی برایت می‌خرم: تۆپێکی خنجیلانەت بو دەکرم›.

**فینواوگرایی** / fîno.'ograyî ☜ **فینوأیغوری**

**فینوایغوری** / fîno.'oyqûrî /: [؟]/اسم. فینۆئۆیغووری: ١. هەر کام لە هوزەکانی باکوور و ڕۆژهەلاتی ئۆرووپا و ڕۆژاوای باکووری سیبری وەکوو وەلاتانی فەنلاند، مەجارستان، لاپلەند ٢. لقێک لە زمانگەلی ئوراڵی کە ئەم هۆزانە پێی دەدوێن * **فینواوگرایی**

**فینه** / fîne ، ـها /: اسم. فینە؛ فێس؛ فێسە؛ فێست؛ فینۆ؛ جۆرێ کلاوی سووری کەللەقەندی سەرقرتاو کە تا ئەم دواییانە لە تورکیە و لوبنان لە سەریان دەکرد.

**فیورد** / fiyord ، ـها /: [؟]/اسم. *[زمین‌شناسی]* لەپاو؛ شیپاو؛ چوونە پێشەوەی باریکەئاوی دەریا لە بەژدا.

**فیوز** / fiyûz ، ـها /: [انگلیسی]/اسم. فیووز: ١. لەتە کانزایەکی کەم بەرگە کە لە سەرەڕێی هاتنی کارەبا بۆ ناو خولگەیەک دادەنرێ تا ئەگەر لە ڕادەی ڕێپێدراو تێپەڕی، بقرتێ و ڕەوتی کارەبا ببڕێ ٢. کلیلی تەقینەوەی نارنجەک، بۆمبا و...

◘ **فیوز پریدن**: فیووز پەڕین؛ بڕانی کارەبا بە هۆی فیووزەوە.

**فیوض** / fuyûz, foyûz /: [عربی] جمعِ ☜ **فِیض**

**فیوضات** / fuyûzāt, foyûzāt /: [عربی] جمعِ ☜ **فِیض**

# ق

**ق** / q/: *حرف.* ق؛ نیشانەی بیست و چوارەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.
**ق**[1] / qe/: *اسم.* قێ؛ قاف؛ ناوی بیستوچوارەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.
**ق**[2]: *صفت. [مخفف]* م.؛ مانگی؛ پێوەندیدار بە کۆچی-مانگیەوە ‹سال دهم هـ. ق.: سالی دەیەمی ک.م.›.
**قائد** / qā'ed/: [عربی] ☜ **قاید**
**قائل** / qā'el/: [عربی] ☜ **قایل**
**قائم** / qā'em/: [عربی] ☜ **قایم ـ۱**
**قائم‌الزاویه** / qā'emozzāvîye/: [عربی] ☜ **قایم‌الزاویه**
**قائم‌مقام** / qā'em.maqām/: [عربی] ☜ **قایم‌مقام**
**قائمه** / qā'eme/: [عربی] ☜ **قایمه**
**قاب** / qāb ، ـها/: *اسم.* قاپ: ۱. [ترکی] دەوریەکی قووڵی گەورە جێگەی چێشت، شیرینی یان میوە لە سەر سفرە یان مێز ۲. [ترکی] ئەو شتەی لە نێو دەفرەکەدایە ‹ یک قاب برنج خورد!: قاپێک برینجی خوارد!› ۳. [ترکی] جەعبە؛ چوارچێوە یان پێکهاتەیەکی وا بۆ شت تێخستن ‹قاب عکس؛ قاب عینک: قاپی وێنە؛ قاپی چاویلکە› ٤. [از عربی] *[کالبدشناسی]* جک؛ جگ؛ جگە؛ کاپ؛ کاب؛ قاب؛ قابک؛ قاچ؛ قاپوورە؛ گوێزینگ؛ کابە؛ کابا؛ کەوان؛ کەوانە؛ ڤینک (ئی حەیوانە کێوی)؛ خەلۆل؛ خەلوول (ئی ڕەشەوڵاخ)؛ چوو؛ میچ؛ جگ‌میچ؛ ماچ؛ دەق؛ ئێسکێکی چوارپالووی هێندێک درێژۆکە لە مەچەکی پێدا لە نێوان بەلەک و پاژنەدا، خازما هی پەز و بزن کە کایەی قاپانی پێ‌دەکرێ: **قاپ**

◙ **قاب عکس**: قاپی وێنە؛ چوارچێوەیەکی پتر شیشەدار کە وێنەی تێدەخەن.
**قاب عینک**: قاپی چاویلکە: ۱. پێکهاتەیەکی تەلی، پلاستیکی، یان تێکەڵێک لەو دووە کە شیشەی چاویلکەی تێدەخەن ۲. *[قدیمی]* جێ چاویلکە؛ قاپ یان کیفی تایبەت بۆ هەڵگرتنی چاویلکە.
**قاب قمارخانە**: *[مجازی]* خولە قوماربـاز؛ بەناوبانگ لە پەرژانە کاری ناڕەوا و نالەباردا.
**قاب گوسالە**: خەلۆل: ۱. میچەگوێلک؛ جگەگۆلک ۲. *[مجازی]* زەبەلاح؛ بڕێتی لە زەلامی ناقۆلا.
◙ **قاب کردن**: لە قاپ‌گرتن؛ قاپ‌گرتن؛ خستنە قاپەوە.
**قاب کسی را دزیدن**: *[کنایی]* کەسێک لە خشتە/ خلیسکی بردن؛ هۆشی کەسێک بردن؛ دڵی کەسێک دزین/ بردن؛ فڕ بە کەسێکەوە نەهێشتن؛ حەز و سەرنجی کەسێک بۆ خۆ ڕاکێشان ‹آرام قاب دختر را

دزدیده بود و می‌دانست با او کنار می‌آید: ئارام کچه‌که‌ی له خشته بردبوو، ده‌یزانی له‌گه‌ڵیدا پێک‌دێ›.

**قاب‌بازی** / qāb.bāzî/: [از عربی/ فارسی]/سم. جگێن؛ جگانێ؛ کابه‌ی؛ کابانه؛ قاپێن؛ قاپانێ؛ قاپان؛ کاپان؛ کاپێن؛ کاپانێ؛ کابانێ؛ قاچانێ؛ ماچان؛ ماچانێ؛ ماچێن؛ میچێن؛ شه‌کێن؛ شه‌گین؛ لاریه‌کاب؛ میرگزیرکێ؛ یاریه‌کی کۆن که به هاویشتنی یه‌ک یان چه‌ند قاپ به‌ڕێوه ده‌چێ و بردنه‌وه یان دۆڕان، به پێی چۆناوچۆن نیشتنی قاپه‌کانه: **قاپبازی**

**قاب‌بال** / qāb.bāl/: [ترکی/ فارسی] صفت. باڵ‌کالانی؛ تایبه‌تمه‌ندی چینێک مێروو به زاری چه‌ن‌تیکه‌ی به قه‌وه‌ت، باڵی ئه‌ستوور و چه‌رمی له پێش و باڵی په‌رده‌یی له پاش و سێ‌جووت پا و شاخه‌کی درێژی یازده پاژیه‌وه، وه‌ک قالۆنچه، مۆرانه و خاڵخاڵۆکه

**قاب‌دستمال** / qābdas(t)māl ، ـها/: [ترکی/ فارسی]/سم. ده‌سماڵێ که له چێشتخانه‌ی ماڵاندا بۆ سڕین یان وشکه‌وه‌کردنی ده‌فر و دۆڵه که‌ڵکی لێ ده‌گرن

**قابسازی** / qābsāzî/: [ترکی/ فارسی]/سم. قاپسازی: ۱. پیشه یان هونه‌ری دروست‌کردنی قاپ (بۆ وێنه، وێنه‌کێشی، تابلۆ، کاتژمێر و...) ۲ /ـها/ کارگه‌ی دروست‌کردنی قاپ. هه‌روه‌ها: **قابساز**

**قابض** / qābez/: [عربی] صفت. ۱. تفت؛ گیر؛ به چێژه‌ی نیوه‌تاڵ و ده‌منووسێنه‌وه ۲ /ـها/ گرێدایی؛ پندر؛ پنر؛ وشک؛ ئاوکێش؛ ئاوچن؛ ناوسک‌گرسێن

**قابل** / qābel/: [عربی] صفت. ۱. شیاو؛ شایسه؛ هێژا؛ شایان ۲ له‌بار؛ له‌باو؛ ده‌رخۆر؛ گونجاو.

▣ **قابل بودن**: ۱. هێژا بوون؛ شیاو بوون؛ له‌بار بوون ‹این پزشک بسیار قابل است: ئه‌م بژیشکه زۆر هێژایه› ۲ هورم بوون؛ به بایه‌خ بوون ‹پول که قابل نیست، جان بخواهید: پاره هورمی نیه، ئێوه گیانتان بوێ›. هه‌روه‌ها: **قابل دانستن**

**قابله** / qābele/: [عربی] حرف. هێژای؛ شیاوی؛ ده‌ردخواردوو؛ له‌بار بۆ؛ له‌باری؛ لێهاتووی؛ ده‌رخۆری؛ ده‌ردخۆری؛ بۆ؛ په‌ی؛ ده‌رده‌وه‌روو؛ خاوه‌ن لێهاتوویی بۆ وه ئه‌ستۆگرتنی کارێک.

▣ **قابل اتساع**: کرانه‌وه‌یی؛ له‌بار بۆ کرانه‌وه.

**قابل اجرا**: به‌ڕێوه‌بردنی؛ له‌بار بۆ به‌ڕێوه بردن.

**قابل احتراق**: سووته‌نی؛ له‌بار بۆ سووتان.

**قابل ارتجاع**: کێشمانی؛ له‌بار بۆ کێش هاتن.

**قابل استفاده**: به‌که‌ڵک؛ به‌کارهاتوو

**قابل اشتعال**: گڕگر؛ سووته‌نی؛ له‌بار بۆ سووتان.

**قابل اعتماد**: جێ‌متمانه؛ جێ‌بڕوا

**قابل اغماض**: لێبووردنی؛ له‌بار بۆ چاوپۆشی؛ هێژای چاوپۆشی.

**قابل انعطاف**: نه‌رم: ۱. نه‌رم و نیان ۲ لخێز؛ لخێز؛ باوخۆر؛ به تایبه‌تمه‌ندی چه‌مانه‌وه‌وه.

**قابل پژوهش**: جێ‌لێکۆڵینه‌وه جێ منێ؛ له‌بار بۆ کنه؛ جێ‌وردکردنه‌وه

**قابل ترحم**: شیاوی به‌زه‌یی؛ جێ‌به‌زه.

**قابل ترقی**: جێ هه‌ڵدان؛ جێ هه‌ڵدانه‌وه

**قابل تعمّق**: شیاوی لێ‌ورد بوونه‌وه/ بیر لێ‌کردنه‌وه/ تێفکرین؛ شایه‌نی تێرامان.

**قابل تغییر**: شیاوی گۆڕان؛ گوهێڕبار.

**قابل خوردن**: خوردنی؛ خوارده‌مه‌نی؛ شیاوی خواردن.

**قابل دزدیدن**: له‌بار بۆ دزین؛ شتێ که بۆ دزین ده‌ست ده‌دا.

**قابل دیدن**: ۱. دیتنی؛ شیاوی چاولێکردن ۲ دیار؛ له به‌ر چاو.

**قابل فروش**: فرۆشتنی؛ بۆ فرۆش؛ شیاوی فرۆتن

**قابل قبول**: شیاوی په‌سن.

**قابل قسمت**: له‌بار بۆ به‌ش به‌ش بوونه‌وه؛ له‌بار

بۆ دابەشین.

قابل لمس: ١. لەمس‌کردنی؛ بە تایبەتمەندی هەست پێ‌کران بە لەمس ٢. هەست‌کردنی؛ لەبار بۆ هەست‌پێکردن.

**قابلدار** / qābeldār/: [عربی/ فارسی] *صفت. [گفتاری]* بەکەڵک؛ قابلدار؛ شیاو؛ بایەخدار؛ بەدەردخۆر؛ دەرەوەر.

**قابلگی** / qābelegî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* مامانی؛ مامایی؛ لقێکی زانستی بژیشکی کە دەپەرژێتە سەر زایین و ئەرک و کاری سەر بە زایین.

**قابلمه** / qāblame ، ـها/: [ترکی]/*اسم.* چان‌چیلک؛ قابلەمە؛ قاولەمە؛ قوشقانە؛ دەفرێکی سەرداری خەلەلە بۆ چێشت لێنان.

**قابله** / qābele ، ـها/: [عربی]/*اسم.* مامان؛ ماما؛ مامانۆ؛ تایە؛ تایەن؛ یاریدەری ژن لە زایینداً.

**قابلیت** / qābelîyyat/: [عربی]/*اسم.* هێگنی: ١. /ـها/ شیاوی؛ شایەن؛ توانا؛ هێژایی ٢. لەباری؛ دەرخۆری؛ هاولەیی؛ لێهاتوویی.

▣ **قابلیت انعطاف:** لخێزی؛ نەرمی.

**قابول** / qābûl/: [ترکی]/*اسم.* پلووسک؛ پلوور؛ پلوورە؛ ئاوپەڕ؛ لووس؛ لووساو؛ لووساوک؛ پلوورک؛ سوول؛ سوولاوک؛ پلووسکی لاوەلای لێواری بان کە باراناوی لێ کۆ دەبێتەوە و لێوە دەڕژێتە خوارێ.

**قاپ** / qāp/: [از عربی] ☜ **قاب ـ ۴**

▣ **قاپ زدن** ☜ **قاپیدن**

**قاپ‌بازی** / qāpbāzî/: [از عربی/ فارسی] ☜ **قاب‌بازی**

**قاپیدن** / qāpîdan/: [ترکی/ فارسی] *مصدر. متعدی. [گفتاری]* // **قاپیدی:** ڕفاندت؛ **می قاپی:** دەرفێنی؛ **بقاپ:** برفێنە// ڕفاندن؛ فڕاندن؛ قاپاندن؛ قاپین؛ قاپان؛ قەپاندن؛ قەپانن؛ پڕدان؛ قرپاندن؛ گلپاندن؛ قاچاندن؛ وارقونن؛ ئەڕفای؛ پڕ پێدا کردن ‹توپ را قاپیدن: تۆپ ڕفاندن›: **قاپ زدن.** هەروەها: **قاپیدنی**

■ صفت فاعلی: **قاپنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **قاپیده** (ڕفیاگ)/ مصدر منفی: **نَقاپیدن** (نەڕفاندن)

**قاتق** / qātoq/: [ترکی]/*اسم. [گفتاری]* پێخۆر؛ پێخوەر؛ ئەو شتە لەگەڵ نان دەیخۆن، بەتایبەت ماست.

**قاتل**[1] / qātel ، ـها؛ ـان؛ ـین؛ قتله/: [عربی]/*اسم.* قاتڵ؛ بکوژ؛ کوژەر؛ کشتۆخ؛ خوێنکەر؛ خوێنیەوار؛ مێرکوژ؛ پیاوکوژ؛ خوونی؛ خووینی؛ ئەوەی کەسێکی کوشتووە ‹قاتل زن جوان دستگیر شد: قاتڵی ژنە جحێڵەکە گیرا›.

**قاتل**[2]: *صفت.* کوژەر؛ بکوژ؛ کوشندە ‹سم قاتل: ژەهری کوژەر›.

**قاتی** / qātî/: [ترکی] *صفت. [گفتاری]* تێکەڵ؛ ئاوێتە؛ ئامێتە؛ تێکەلاو؛ گیژەڵ؛ بەرناڤدایی؛ دیەک: **قاطی**

▣ **قاتی شدن:** تێکەڵ بوون؛ تێکەلاو بوون: ١. ئاوێتە بوون ‹پولها قاتی شدند، جداشان کن: دراوەکان تێکەڵ بوون، جیایان‌کەوە› ٢. *[مجازی]* هامشۆ هەبوون؛ پێوەندی و هات‌وچۆ هەبوون ‹حسابی با همسایەها قاتی شده بود: لەگەڵ دراوسێکان تەواو تێکەڵ بووو›.

**قاتی کردن:** ١. تێکەڵ کردن؛ تێکەلاو کردن؛ ئاوێتە کردن؛ بەرناڤ دان ‹کمی هم شکر قاتی کن، خوشمزەتر می‌شود: توزێکیش شەکری تێکەڵ کە، خۆشتر دەبێت› ٢. *[مجازی]* تێکچوون؛ ئاڵۆز بوون ‹بابام امروز حسابی از دست همسایەها قاتی کرده بود: بابەم ئەمڕۆ لە دەستی دراوسێکان تەواو تێکچوو بوو› ٣. تێکەڵ کردن؛ تێکەلاوکردن؛ کێشانە ناو ‹او را هم قاتی این دعوا نکن!: ئەویش تێکەڵی ئەم شەڕە مەکە!›.

**قاتی‌پاتی** / qātîpātî/: [ترکی/ از ترکی] *صفت. [گفتاری]* ئاڵۆز پلۆز؛ تێکەڵ‌پێکەڵ؛ شەقلێ پەقلێ؛ تەڤلهەڤ.

**قاچ** / qāč ، ـها/: [ترکی]/*اسم. [گفتاری]* قاش؛ قاژ؛ قاژە؛ خاش؛ کووز؛ کویز؛ کووزە؛ کوویز؛ تیلم؛

تیلمە؛ بڕشت؛ دێلم؛ چینە؛ ڕیف؛ فترک؛ خارچک؛ تۆفل؛ تیفل؛ لاهۆرە؛ کیز؛ قراش؛ کووزیە: ١. هەڵدڕاوی یان قەڵشی قووڵ لە شتێکدا کە ناوەکەی لێوە دیار بێ ٢. لەتە بڕاوی شتێ کە شوێنەکەی وەک قەڵشتی لێ‌هاتبێ ‹قاچ هندوانه: قاشی شووتی›: **قاش؛ قارچ** *[گفتاری]*

▣ **قاچ زین:** کەڵوە؛ قەڵپووز؛ سەرقاچ؛ پێشکۆ؛ بەرکۆ؛ کەلبووز؛ قەرپۆس؛ قارپۆس؛ قەرپووس؛ بەرزی بەرەوەی زینی ئەسپ.

▣ **قاچ خوردن:** قەڵشان؛ قڵیشان؛ قاژ بردن؛ قەڵشین؛ تلیشان.

**قاچ دادن:** قڵیشاندن؛ قەڵشاندن؛ تلیشاندن؛ دڕاندن؛ ترەکنەی؛ ترەکنایوە؛ تلیشنای؛ درز پێدان؛ لێک‌کردنەوە ‹سرما و باد پوستش را قاچ داده بود: سەرما و با پێستی قلیشاندبوو›.

**قاچ کردن:** قاش‌کردن؛ قاژکردن؛ کووزکردن؛ کووزکەردەی ‹هندوانه را قاچ کرد و آورد جلو مهمان‌ها: شووتیەکەی قاش کرد و هێنایە پێش میوانەکانەوە›.

**قاچاق** / qāčāq/: [ترکی] *صفت.* ١. قاچاخ؛ قەچاخ؛ دژ بە قانوون ٢. هەڵوەدا؛ دەرکەفتە؛ وایەن؛ هەڵاتوو.

▣ **قاچاق بودن:** قاچاخ بوون: ١. قەدەغە بوونی ڕاگرتن، کڕین و فرۆش یان بەرهەم هێنانی شتومەکێک ٢. *[گفتاری]* هەڵوەدا بوون؛ وایەنی بوون.

**قاچاق شدن:** قاچاخ بوون؛ قاچاخ‌کران؛ دژ بە قانوون هێنان یان ناردن (زۆرتر بۆ کاڵا).

**قاچاق کردن:** قاچاخ‌کردن: ١. ڕفاندن؛ دزین؛ بە نهێم بردن ٢. دژ بە قانوون هێنان یان بردن.

**قاچاقچی** / qāčāqčî ، ـها؛ ـان/: [ترکی] *اسم.* قاچاخچی؛ قەچاخچی؛ سەوداگەری ماڵی قاچاخ.

**قاچاق‌فروش** / qāčāqfurûš ، ـها؛ ـان/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* قاچاخ‌فرۆش؛ قاچاخ‌ورەش؛ فرۆشیاری شتومەکی قاچاخ. هەروەها: **قاچاق‌فروشی**

**قاچاقی** / qāčāqî/: [ترکی] *قید.* قاچاخی؛ بە نهێنی و شێوەی دزەکی.

**قادر** / qāder/: [عربی] *صفت. [ادبی]* لێهاتوو؛ لێهاتگ؛ توانا؛ بەهێز؛ بە وزە؛ بە بڕشت؛ زۆخ؛ زووخ.

▣ **قادر بودن:** توانین؛ لێهاتن؛ تاوەی؛ کارین؛ قارین؛ بە توانا بوون ‹انسان قادر است کوهها را جابجا کند: مرۆ دەتوانێ کێو لە بن بێنێ›.

**قاذورات** / qāzûrāt/: [عربی] *اسم. [ادبی]* فزوو؛ گەماری؛ قلێری؛ پیسی؛ پیسایی؛ چەپەڵی.

**قاراشمیش** / qārāšmîš/: [ترکی] *صفت. [گفتاری]* شێواو؛ شپرز؛ ئاڵۆز؛ تێکەڵ و بێ‌سەرە و بەرە ‹از وقتی آزاد رفته وضع کارخانه قاراشمیش شده: لەو کاتەوە ئازاد ڕۆیشتووە بار و دۆخی کارخانەکە تەواو شێواوە›.

**قارت‌وقورت** / qārt-o-qûrt/: [ترکی] ☜ **هارت‌وپورت**

**قارچ** / qārč/: *اسم.* ١. ـها/ کارگ؛ کوارگ؛ کدارک؛ کارک؛ کاڤیلک؛ کاڤیرک؛ کارۆک؛ کڤارگ؛ کەڤارک؛ کەیارک؛ کوارگز؛ خارچک؛ خاچک؛ قارچک؛ قاچ؛ قارچ؛ قاچک؛ قارچک؛ هەلچی؛ کولافک؛ فترک؛ کومبەلۆک؛ کەمبەلۆک؛ کاکڤلک؛ کاری؛ کفکار؛ قیفار؛ قیڤار؛ کومکاهاچی؛ باجی‌کۆکا؛ دۆمەلان؛ کولافێ؛ حاجی‌ڕەشکێ؛ ڕوەکی بێ‌ڕەگ و قەد و گەڵا و بێ‌ماکی کلورۆفیل کە ناتوانێ بۆ خۆی خواردەمەنی دابین بکا، لە سەر لەشی زیندەوەر یان پاشماوەی مردوو، بە یارمەتی تیشکی خۆر، وەکوو باکتری و کەڕوو دەژی ٢. ☜ **قاچ ـ ٢**

▣ **قارچ چمنی:** کارگە بەرسوولکە؛ کارگە مێرگە؛ جۆرێ کارگی خۆراکی کە لە شوێنی تاریک و شۆداردا دەڕوێ، بە چەتری گۆشتی

لووسەوە کە پاشان دەقەڵشێ و پووڵەکە ـ پووڵەکە دەبێتەوە.

**قارچ دشتی:** کوارک؛ کوفکارک؛ کارگی دەشتی؛ کارگەی دەشتان.

**قارچ سمّی:** گولانە؛ کارگە گولانە؛ کارگە گولە؛ قارچکە گولانە؛ قارچکە مارانە؛ قارچکێ کە ماکی ژەهراوی تێدایە.

**قارچ صحرایی:** کارگی کەما و لۆ؛ کارگی هەلز؛ جۆرێ کارگی خۆراکی بە چەتری گۆشتی سپیەوە کە گۆشتەکەی سفتە و بۆنێکی خۆشی هەیە.

**قارچ کوهی:** کارگە کوێستانی؛ کارگە کەما؛ جۆرێ قارچکی خواردەمەنی کە چەترێکی بە شێوەی ڕەحەتی هەیە.

**قارچ شناسی** / qārčšenāsî/: *اسم.* کارگناسی: ۱. *[گیاه‌شناسی]* بەشێک لە زانستی گیاناسی کە بە ناسین و پۆلێن‌کردنی قارچەکانەوە دەپەرژێ ۲. *[پیراپزشکی]* بەشێ لە زانستی ئەنگەلناسی پێوەندیدار بە ناسین و بەرخوەدان لە هەمبەر نەخۆشیگەلی قارچیەوە.

**قارچی** / qārčî/: *صفت.* کارگی؛ قارچی؛ قارچکی: ۱. سەر بە کارگ ‹بیماری قارچی: نەخۆشی کارگی› ۲. بە بیچم یان تایبەتمەندی کارگەوە ‹گیاهان قارچی: ڕوەکی کارگی›.

**قار ـ قار** / qārqār/: *صوت.* قارەقار؛ قار ـ قار؛ قرەقر؛ قغ ـ قغ؛ قغەقغ؛ دەنگی قەلەڕەشە: **غار ـ غار**

▣ **قار ـ قار کردن:** قراندن؛ قرانن؛ قیڕنەی؛ قیڕنای؛ قارە ـ قارەکردن؛ قرین.

**قارقارک** / qārqārak، ـها/: *اسم.* ترترە؛ هارە؛ هاڕێ: ۱. *[قدیمی]* ئامرازی کایەی منداڵان کە دەنگێکی وەک قارقاڕی لێ دەهات ۲. *[مجازی]* ئامرازی کۆن و نیوەکارە کە دەنگی ناخۆشی کرەکر یان هارەهاری لێ دێ (وەک ڕادیو، تەلەفوون، ماشین و...).

**قاروقور** / qār-o-qûr/: *صوت.* قۆرە؛ قرە؛ قڕە؛ قوورە؛ قۆرەقۆر؛ قوورەقوور؛ غور ـ غور؛ خورەخور؛ دەنگێک کە جار ـ جار لە کاتی برسیەتیدا لە سکەوە دەردێ: **غار و غور**

▣ **قار و قور کردن:** قۆراندن؛ قۆڕانن؛ قۆڕەقۆڕ کردنی زگ: **غار و غور کردن**

**قاره** / qārre، ـها/: [عربی] *اسم.* قورنە؛ بەژایی؛ هەر کام لە حەوت پاژی گەورەی وشکی لە گۆی زەویدا کە ئوقیانووس دەوری گرتوون.

**قاری** / qārî، ـها؛ ـان؛ قُرّاء/: [عربی] *اسم.* قاری؛ مرۆڤێ کە دەقێک دەخوێنێتەوە، بەتایبەت ئەوەی قورئان‌خوێن.

**قازیاغی** / qāzyaqî/: [ترکی] *اسم.* قازیاخە؛ قازیانە؛ لیشرێ؛ مەوەنوس؛ گیابەڵەکی؛ گیادۆکولیو؛ ڕوەکێکی بەهاری بە گەڵای پان و گوڵی سپی و بەری ورد و ڕەشەوە، بۆنخۆشە و بە کوڵاوی دەخورێ و بۆ دەرمانی نەخۆشی پێستیش بە کار دەچێ: **قازیاقی**

**قازیاقی** / qāzyaqî/: [ترکی] ☜ **قازیاغی**

**قاسناق** / qāsnāq/: [؟] ☜ **کُم**

**قاش** / qāš/: [ترکی] ☜ **قاچ ـ ۲**

**قاشق** / qāšoq، ـها/: [ترکی] *اسم.* کەوچک؛ کەچک؛ کەفچک؛ کەڤچک؛ کەڤچی؛ کەفچی؛ کەوچە؛ کەمچک؛ کەمچە؛ کەچی؛ کۆچکە؛ کاچ؛ کاچک؛ چەمچک؛ چووچک؛ چەوچ؛ چەمچ؛ چەمچە؛ چمچە؛ چەفچە؛ ملاک؛ مێلاک؛ مەلاک؛ قاشوق: ۱. ئامرازێک پتر بە شێوەی ڕووبەرێکی گردی ناوچاڵ و دەسکدار، بۆ هەڵگرتن یان تێکەڵ‌کردن یان خواردنی چێشت ۲. ئەو شتەی لە نێویدایە ‹روزی ۳ قاشق میل شود: ڕۆژێ ۳ کەوچکی لێ بخورێ›.

▣ **قاشق چایخوری:** کەوچکە چای؛ کەوچک چای؛ چەمچەو چای/ چەی؛ کەوچکێکی چکۆلە بۆ شێواندنی شتی نێو ئیسکان و پیالە (وەک شەکر، قاوە، شیر و ...).

**قاشق غذاخوری:** کەوچکی‌چێشت؛ کەوچکی

چێشتخۆری؛ چەمچەو چاشتواردەی؛ کەوچکی هێندێک گەورە بۆ چێشت خواردن.
قاشق مرباخوری: کەوچکەمەرەبا؛ کەوچکی مرەباخۆری؛ کەوچکێک نەختێ گەورەتر لە کەوچکەچای.

**قاشق زنی** / qāšoqzanî/: [ترکی/ فارسی]/سم. حەلاوەمەلاوە؛ هەلاوەمەلاوە؛ حەتەلەمەتەلە؛ ڕێورەسمێکی کۆنی شەوی چوارشەممەسووری لە ئێراندا کە منداڵان و تازەلاوان سەر و چاویان دادەپۆشن و بە کاسە و کەوچکێکەوە دەچنە بەر دەرکی جیرانان و بە تەقەتەق کردن، داوای دیاری و خواردەمەنی دەکەن.

**قاشقک** / qāšoqak ، ـها/: [ترکی/ فارسی]/سم. *[موسیقی]* سازێکە بە شێوەی دوو ژێرپیاڵەئاسای چێوی کە بە قەیتانێک پێکەوە بەسراون و بە لێکدانیان دەنگێکی وشک و نزم دەردێ.

**قاصد** / qāsed ، ـها؛ ـان/: [عربی]/سم. هەواڵبەر؛ شاندیار؛ شاندیەک؛ شاندۆخ؛ قاسوو؛ پەیک؛ ڕاسپاردە.

**قاصدک** / qāsedak ، ـها/: [عربی/ فارسی]/سم. بایلکە؛ باویلکە؛ باویلێ؛ باوەلێ؛ بابردەڵە؛ پەپوو؛ پەپوولەپایزە؛ پەپووەپاییزان؛ پشیلەپایزە؛ پشیپایزە؛ پشیلۆک؛ شەلەمینخۆشکەرە؛ شەلەمینکەرە؛ کەوکەڤۆک: ١. گیایەکی ئاڵفی، گەڵا بڵاوی نووکتیژ و ددانەدارە بە گوڵی زەردی ڕۆشن لە سەر لاسکی بەرزەوە ٢. کاسەگوڵی خڕی چەترئاسای میوەی ئەو گیایە کە زۆر سووکە و بە سانایی با هەڵیدەفڕێنێ: **گل قاصد**

▣ **قاصدک بهاری**: بەلازیز؛ بلازیز؛ گوڵەگەزیزە؛ گوڵێکی کورتەباڵای خێڕخێڕی شین و سپیە کە لە سەرەتای نەورۆزدا سەر هەڵدەدا و زۆر تەمەن کورتە.

**قاصر** / qāser/: [عربی] *صفت. [ادبی]* کورت؛ کوڵ؛ کۆتا؛ کول؛ بێدەسەڵات ‹زبان من از بیان آن قاصر است: زمانم لە دەربڕینی کورتە›. هەروەها: **قاصر بودن**

**قاضی** / qāzî ، ـها؛ ـان؛ قضات/: [عربی]/سم. دادوەر؛ قازی: ١. دادپرس؛ کەسێ کە بە شکاتی خەڵک ڕادەگا ٢. داوەر.

▣ **قاضی تحقیق**: دادوەری لێکۆڵینەوە.
**قاضی شرع**: حاکمی شەرع؛ کەسێ کە سەبارەت بە کێشەی شەرعی دادگەری دەکا.
**قاضی عسکر**: قازی عەسکەر؛ کەسێ کە بەرپرسی ئەنجامدانی ڕێورەسمی ئایینی ئەرتەشە.

▣ **تنها به قاضی رفتن** ☜ **تنها**[1]
**کلاه خود را قاضی کردن** ☜ **کلاه**

**قاطبه** / qātebe/: [عربی] ضمیر. هەموو؛ هەمی؛ گشت؛ گرد؛ کول؛ تەڤ.

▣ **قاطبەی اهالی**: گلایێ؛ گشت/ هەموو خەڵک؛ هەموان؛ هەموو خەڵکان؛ گردوو مەردمی.

**قاطر** / qāter ، ـها؛ ـان/: [از سغدی]/سم. قاتر؛ قانتر؛ ئەستر؛ هەستر؛ هەسەرە؛ ئێستر؛ هێسر؛ هێستر؛ بزی؛ تور؛ چاڤری؛ چاروایەکی دووڕەگەی لە نێرەکەر و ماینە کە نەزۆک و بەهێزە و بۆ بار بردن دەبێ.

**قاطع**[1] / qāte'/: [عربی]/سم. *[هندسه]* هێڵێ کە کەوانە یان پەڕەیەک تێپەڕ دەکا.

**قاطع**[2]: *صفت. [ادبی]* بە بڕشت؛ بڕشتدار؛ نەگۆڕ؛ بڕمێن؛ بڕەدار؛ بڕاوە؛ بە بڕ؛ بە زیپک؛ بە زەبر و زەنگ ‹آدم قاطع؛ تصمیم قاطع: مرۆی بەبڕشت؛ بڕیاری نەگۆڕ›.

**قاطعیت** / qāte'îy(y)at/: [عربی]/سم. زەبر و زەنگی؛ بڕشتی؛ زیپک؛ زاکوون؛ هوود.

**قاطی** / qātî/: [ترکی] ☜ **قاتی**

**قاعدتاً** / qā'edatan/: [عربی] *قید.* وەک دەبێ؛ وەک چاوەڕوان دەکرێ؛ بە پێی دەستوور/ داب/ ڕێوشوێن/ ڕێ و ڕەوش ‹قاعدتاً مشکلی ندارد: وەک دەبێ **گرفتێکی نیە**›.

**قاعدگی** / qā'edegî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* پۆن؛ بێنوێژی؛ بێنڤێژاهی؛ مەهیک؛ مەهک؛ مەهکی؛ وەهک؛ کنج؛ مانگانە؛ حەیز؛ جنک شووردن؛ خولی هەڵڕژانی خوێن و ئاوی منالدان لە ژن و برێ ئاژەڵی مێوینەدا، کە لە کاتی ئاوس نەبوون (لە مرۆدا) هەر چوارحەوتوو جارێ ڕوو دەدا.

**قاعده**[1] / qā'ede ، ـها؛ قَواعد/: [عربی]/*اسم.* ١. داب؛ نەریت؛ دەستوور؛ ڕێوشوێن؛ ڕست؛ ڕێسا؛ دەستووری پەسنکراو بۆ کار یان کردەوەیەک ‹قاعدەی بازی: دابی یاری› ٢. هۆرتە و بەرە؛ ئاکاری باوی پەسنکراو سەبارەت بە دیاردە، کەس یان کۆمەڵێک. بەرانبەر: **استثنا** ٣. *[هندسه]* بنواشە؛ بنک؛ بنەوان؛ تەختی بیچمێکی هەندسی.

**قاعده**[2]: *صفت.* بێنوێژ؛ پۆنی؛ لە پۆندا بوو.

⊡ **قاعده شدن:** پۆنی/ بێنوێژ/ مەهیکی بوون؛ تووشی بێنوێژی بوون.

**قاف** / qāf/: *اسم.* قاف: ١. [عربی] نێوی عەرەبی بیست و چوارەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی ٢. *[اساطیر]* کێوێکی خەیاڵی لە شوێنێکی دوورەدەستدا، لەو پەڕی گۆی زەوینەوە: **کوه قاف**

**قافله** / qāfele ، ـها؛ قَوافل/: [عربی]/*اسم.* کاروان؛ کەروان؛ قافڵە؛ شەقار؛ دەستەیەک مرۆ و بارەبەر کە ڕێبواری ڕێگایەکن ‹قافلەی حجاج: کاروانی حاجیان›.

⊡ **از قافله عقب ماندن:** *[کنایی]* لە کاروان جێمان؛ لە گەل/ کاروان بڕان؛ لە یاران/ هاوڕێیان بەجێمان ‹دیگران ماشین و خانه داشتند او هم نمی‌خواست از قافله عقب بماند: باقی ماشێن و ماڵیان بوو، ئەویش نەیدەویست لە کاروان جێ بمێنێ›.

**قافله‌سالار** / qāfelesālār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ١. *[قدیمی]* پێشەنگ؛ سەرجەلە؛ سەرقافڵە؛ سەرکاروان؛ سەرقەتار ٢. *[کنایی]* پێشەوا؛ سەرۆک ＊ **کاروانسالار**

**قافیه** / qāfîye ، ـها؛ قَوافی/: [عربی]/*اسم.* *[ادبی]* بەشاوەند؛ بەشاڤەند؛ پاشبەند؛ سەروا؛ پاشۆڵ؛ پاشڵ؛ قافیە؛ وشەگەلێ بە بڕگە یان بڕگەگەلێکی هاوبەشەوە کە لە کۆتایی هەر دوو باڵی یەک بەیت یان کۆتایی بەیتەکانی هەڵبەستێکدا دێن، بە مەرجێ کە مانایەکی سەربەخۆ نەگرنە خۆ (وەک «سێوان» لە بەیتی «لە دوگمەی سوخمە دوێنێ نوێژی شێوان/ بەیانی دا سپیدەی باغی سێوان» کە بڕگەگەلی «ـێوان» لە هەردووک باڵدا هاوبەشن).

⊡ **قافیه بر کسی تنگ شدن:** *[مجازی]* دەرەتان لە کەسێک بڕان؛ زیپ بۆ کەسێ هاتن؛ دنیا لە کەسێک بوونە کونەمشک؛ کەوتنە نێو زەحمەت و دەردیسەرەوە ‹وقتی قافیه بر او تنگ شد به خواهش و التماس افتاد: کاتێ دەرەتانی لێبڕا کەوتە تکا و لالە›.

**قافیه را باختن:** *[مجازی]* هەل/ دەرفەت لە کیس چوون/ دان؛ بە قنگا کەوتن؛ دۆڕاندن ‹دیر بجنبی قافیه را باختەای: دەستی خۆت نەوەشێنی هەلت لە کیس داوە›.

**قاق** / qāq/: [ترکی]/*اسم.* ١. بازڕ؛ لەتکە؛ لەتە؛ قاقاڵە؛ میوەی وشکەوەکراو وەک قەیسی، هەڵووژە و هەشتاڵوو ٢. قرە؛ لە کایەگەلی نۆرەییدا (وەک قاپێن و گوێزان) ئەو کەسەی کە دوا نۆرەی پێ بڕاوە ٣. واک؛ واق‌واق؛ ماسی‌گرە؛ ماسی‌گرەک؛ ماسی‌گیر؛ ماساوگر؛ قەلمراو؛ ماسی‌خۆرە؛ باڵدارێکی سپیە ڕاوە ماسی دەکا ٤. *[قدیمی]* قاورمە؛ قاق؛ گۆشتی برژاوی وشکەوەکراو.

**قا ـ قا** / qāqā/: *اسم.* *[کودکانه]* نۆ ـ نۆ؛ ننوو؛ قەقە؛ ققە؛ قاقە؛ خۆراکی خۆش لە زمانی منداڵاندا، نەخوازە شیرینی: **غا ـ غا**

**قاقاله** / qāqāle/ ☜ **قاق ـ ١**

**قاقاليا** / qāqāliyā/: *اسم.* پێقەلە؛ کێشە؛ ڕەکێشە؛ گیایەکی دەشتەکی بە گەڵای پانی

ڕەگاوی و گوڵی سپی و تۆوی کوڵکن و لە بڕێکیدا گوڵی بۆنخۆشەوە، کە زیاتر بە کاری برین گەیاندن دێ: **قاقل**

**قاقل** / qāqol/ ☜ **قاقالیا**

**قاقا ـ لی‌لی** / qāqālîlî ، ـها/: /اسم. قاقە؛ قەقا؛ قەقە؛ ققە؛ کەکا؛ شیرینی و خۆراکی بابی دڵی منداڵان.

**قاقم** / qāqom/: [عربی]/اسم. خەز؛ قاقم؛ قاقوم؛ ئاس: ١. /ـها/ دەڵەکی سپی؛ جۆرێ گیانداری خەزدارە لە دەڵەک دەچێ و لە ناوچە شاخاویەکاندا دەژی. هاوینان بەشی ژووریی پێستی خورمایی و بەشی خوارینی سپیە بەڵام لە زستاندا جگە لە ئاخری کلکی کە ڕەشە، باقی جەستەی سپی دەبێتەوە ٢. پێستی ئەو گیاندارە کە زۆر نەرمە و جل‌وبەرگی لێ دروست دەکەن.

**قال** / qāl ، ـها/: /اسم. ١. [عربی]/گفتاری/ قاڵ؛ قرم‌وقاڵ؛ گرم‌وقاڵ؛ قاڵەقاڵ؛ هەرا؛ زەنا؛ چەقە و گوڕە؛ قاو و قوو؛ قاوەقاو؛ قایش ٢. [از عربی] گاهـ ؛ گەهـ ؛ بۆتە؛ دریچە؛ بووتە؛ جۆرێک کاسەی گڵێنی وەکوو کوورەی چکۆلە بۆ شت تێدا تاواندنەوە * **غال**

▣ **قال چاق کردن**: هەرا چاخ‌کردن؛ قیڕ و واڕ کردن/ دانان؛ هەرا و هوریا کردن؛ هەرا و هوریا نانەوە؛ هاوهوڕا دروست‌کردن؛ قا و قیڕ کردن؛ قیڕە و هەرا کردن؛ هەرا و مەزات‌کردن؛ هەرە و مەزات ڕێک وسەی ‹دوست ندارم باز بروی و قال چاق کنی: پێم خۆش نیە دیسانەوە بڕۆی و هەرا چاخ بکەی›.

**قال چیزی راکندن**: /مجازی/ شەڕی شتێک برینەوە؛ شتێک لە کۆڵ‌کردنەوە؛ شتێک لە بنەهێنان؛ برینەوە/ تەواوکردنی کار یان باسی شتێک ‹این دو قاشق را بخور و قالش را بکن: ئەم دوو کەوچکەش بخۆ و شەڕی ببڕەوە›.

**قال چیزی را خواباندن**: سەری شتێک نانەوە؛ قەپ و قاڵی شتێ نەهێشتن و بەر بە ئاژاوەیەک گرتن ‹با کمک همسایگان قال را خواباندند: بە یارمەتی دراوسێکان سەریان نایەوە›.

هەروەها: **قال خوابیدن**

**قال گذاشتن**: /مجازی/ ١. دەس لە خەنە نان؛ لە سەر دار دانان؛ بە هۆی ئامادە نەبوون لە سەر بڕیار، کەس یان کەسانێک ماتڵ‌کردن ‹دیروز نیامدی و چهار ساعت ما را قال گذاشتی: دوێنێ نەهاتی و چوار سەعات دەسمانت لە خەنە نا› ٢. لە ژوانی ژووژکان دانان؛ بردن بۆ ژووژووەڕاو؛ بە جێ‌هێشتن؛ کەسێک لە شوێنێک دانان و بە نهێنی بۆی دەرچوون ‹ دختر بیچاره را قال گذاشت و بعد از چهار ماه سر از آلمان درآورد: کچەی بەستەزمانی لە ژوانی ژووژکان دانا و دوای چوار مانگ سەری لە ئاڵمانەوە هەڵێنا›.

**قالب** / qāleb ، ـها/: [معرب از یونانی]/اسم. قاڵب؛ قالب؛ قالک: ١. قاپلۆخ؛ قلاپیک؛ ڕیتە؛ ئامرازێک بۆ شکڵ پێدانی ماک و بەرهەمەکانی ‹قالب کفش: قالبی پێڵاو› ٢. ئەو بەرهەمانە لە قالبێکەوە دەردێن، بەتایبەت ئەوانەی چوار پاڵوون ‹یک قالب صابون: قالبێک سابوون› ٣. /مجازی/ چوارچێو؛ چوارچۆقە؛ قاپۆرە؛ قاپلۆخ؛ قابلۆغ ٤. /مجازی/ ڕیت؛ وێنە؛ شێوە؛ بیچم؛ تەرح ٥. /قوالب/ تەن؛ پەیکەر؛ کەلەخ؛ کەلەستە.

▣ **قالب ریخته‌گری**: بڕێژ؛ داڕێژگە؛ لاک؛ ڕێجە؛ دەریچە؛ قال؛ ڕێختمان؛ ڕێژە؛ ڕێژەک؛ قالبی داڕشتن.

▣ **قالب بودن**: فیت بوون؛ ڕێک خۆی بوون؛ فیت خوەی بوون؛ وەک/ جفت خۆی بوون؛ قالب بیەی ‹لباسها کاملاً قالب تنش بود: جلەکان فیتی بەری بوو›. هەروەها: **قالب شدن**

**قالب تهی کردن**: /مجازی/ بنەتۆقە گەیشتن؛ فجووق/ فنجق/ فجیق‌کردن؛ زیک‌کردن؛ زاڵە تۆقین/ ترەکین؛ لەترسان مردن ‹از ترس داشت

قالب تهی می‌کرد: لە ترسان بنەتوقەی گەیشتبوو›.

**قالب زدن:** ١. قاڵب لێدان؛ دەقاڵب‌کردن ٢. هەڵبەستن؛ شتێک بە درۆ نیشاندان.

**قالب کردن:** *[مجازی]* قەولاندن؛ بە فێڵ و تەڵەکە بە کەسێ فرۆشتن ‹جنس را بە نام خارجی قالب مردم می‌کرد: شت‌ومەکی بە ناوی خارجی ئەقەولاندە خەڵک›.

**قالب‌ریزی** / qālebrîzî ، ـها/: [معرب/ فارسی] *اسم.* کار یان ڕەوتی دارشتن؛ دارڕژاندن؛ دارڕژتن؛ دارڕستین؛ شتێک دەنێو قاڵب‌کردن بۆ ئەوەی ڕێتی ئەو قاڵبە بگرێ.

**قالب‌سازی** / qālebsāzî/: [معرب/ فارسی] *اسم.* قاڵب‌سازی: ١. کار و لێزانی دروست‌کردنی قاڵب ٢. /ـها/ کارگەیەک کە تێیدا قاڵب دروست دەکەن. هەروەها: **قالب‌ساز**

**قالبگیری** / qālebgîrî ، ـها/: [معرب/ فارسی] *اسم.* قاڵبگری؛ کار و ڕەوتی گۆزانەوەی ڕێتی شتێ بۆ سەر ماکێکی هەویری بە مەبەستی دروست کردنی قاڵبەکەی.

**قالبی** / qālebî/: [معرب] *صفت.* قالبی: ١. لە نێو قاڵب دروست‌کراوی وەک قاڵب دەرهاتوو ‹یخ قالبی: سەهۆڵی قاڵبی› ٢. *[مجازی]* هەڵبەستراو ‹این حرفهای قالبی را تحویل مردم نده: ئەم قسە هەڵبەستراوانە مەکە بە قوڕووی خەڵکدا›.

**قالپاق** / qālpāq ، ـها/: [ترکی] *اسم.* قاڵپاخ؛ قاڵپاق؛ کاسەیەکی کانزایی کە بە ناوەڕاستی تەگەرەی ماشینەوە دەبەسرێ و سەر جڕ و مۆرەکان دادەپۆشێ.

**قالتاق** / qāltāq ، ـها/: [ترکی] *صفت.* *[گفتاری]* ڕیپۆ؛ نادروس و فێڵباز؛ تەڵەکەبازی درۆزن و چەورزمان.

**قال‌مقال** / qālmaqāl ، ـها/: [عربی] *اسم.* *[گفتاری]* قوولە؛ هەرا و هوریا؛ قیڕ و قاڵ؛ قێڕە و هەرا؛ هەرا-هەرا؛ هەرا و مەزات؛ هەرە و مەزات؛ چەقە و گوڕە؛ زەنا-زەنا؛ چەقە و زەنا؛ قایش؛ غەڵبە؛ دەنگەدەنگ؛ غەڵبەغەڵب؛ دەنگ و هەرای هاوڕێ لەگەڵ شەڕ و چەقەدا.

◘ **قال‌مقال کردن:** هەرا و هوریا کردن؛ هەرە و مەزات‌کەردەی؛ زویلەزویل‌کردن؛ قیڕ و واڵ کردن؛ قیڕە و هەرا کردن ‹چرا برای هیچ و پوچ قال‌مقال می‌کنی؟: بۆچی لە سەر هیچ و پووچ هەرا و هوریا دەکەی؟›. هەروەها: **قال‌مقال راه انداختن**

**قالی** / qālî ، ـها/: *اسم.* قاڵی؛ قالی؛ قالیە؛ خالی؛ مەهفوور؛ مافوور؛ ماهفوور؛ مافوورە؛ مافوویر؛ مافیر؛ مەحفیر؛ مەحفوویر؛ مەحفویر؛ مەهووز؛ بەستیر؛ گەوە؛ بکۆ؛ بسکۆ؛ تێژک؛ ڕایەخی بە تەوەن تەنراوی پرزەدار بۆ پۆشانی ناوماڵ.

◘ **قالی کنارە:** لاکێش؛ کەنارە؛ کنارە؛ قاڵی درێژۆکە.

**قالی ماشینی:** قاڵی ماشینی؛ قاڵی بە ماشین تەنراو.

**قالی کرمان:** *[مجازی]* کای بێ دان؛ کەسێ یان شتێک کە بە تێپەڕ بوونی کات هەر دێت و جوانتر دەبێ و زیاتر هەڵدەدا ‹سارا انگار قالی کرمان است، هر چە سنش بالاتر می‌رود، خوشگلتر می‌شود: سارا دەڵێی کای بێ دانە، هەر چی تەمەنی زۆرتر دەبێ، زیاتر بەخۆدا دێ›.

**قالیباف** / qālîbāf ، ـها؛ ـان/: *اسم.* تەونکەر؛ تەونگەر؛ تەونەگەر؛ تەڤنگەر؛ تەونەوان؛ جوومەکار؛ جوومەکڤان؛ قاڵیچن؛ فەرشکەر؛ گەوەباف؛ کەسێ کە قاڵی دروست دەکا: **فرشباف**

**قالیبافی** / qālîbāfî/: *اسم.* تەونەوانی؛ تەونکەری؛ تەونگەری؛ قاڵیچنی؛ گەوەبافی: ١. کاری دروست‌کردنی قاڵی ٢. /ـها/ کارگای تەون‌کردن ❋ **فرشبافی**

**قالیچە** / qālîče ، ـها/: *اسم.* قاڵیچە؛ قالیچە؛ مەحفویرک؛ مەحفیرک؛ قاڵی لە ئەندازەی

بچووکتر له دوو له سێ (میتر).

**قالیشویی** / qālîšûyî/:/اسم. قاڵیشۆری: ۱. کاری قاڵی شتن ۲. /ـها/ کارگەی قاڵی شۆردن.

**قالی‌فروشی** / qālîfurûšî/:/اسم. قاڵی‌فرۆشی؛ قاڵی‌ورەشی: ۱. کاری فرۆشتنی قاڵی ۲. /ـها/ فرۆشگای قاڵی * **فرش‌فروشی**

**قامت** / qāmat، ـها/:/اسم. ۱. [عربی] بەژن؛ باڵا؛ قەد؛ تمتێل؛ بەرزی؛ لە تەپڵی سەرەوە تا ژێر پێ ‹آن دختر قامت بلندی داشت: ئەو کچە بەژنێکی بەرزی هەبوو› ۲. [از عربی] قامەت؛ فەرمانی دەسپێکردنی نوێژ بە جەماعەت.

◘ **قامت بستن**: *[مجازی]* قامەت بەستن؛ نوێژ دابەستن؛ بۆ نوێژ وەستان.

**قاموس** / qāmûs، ـها/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* ۱. قامووس: فەرهەنگ؛ وشەنامە؛ وشەدان ۲. سرشت؛ زات؛ خوو؛ هیم ‹دروغ در قاموس ما نیست: درۆ لە سرشتی ئێمەدا نیە›.

**قانع** / qāne'/: [عربی] *صفت*. دڵ‌تێر؛ چاوتێر؛ بۆین: ۱. بێ‌تەماح؛ خاوەن خوو و خدەی ڕازی بوون ‹آدم که قانع باشد نیازی به تملّق گفتن ندارد: مرۆڤ کە دڵ‌تێر بوو پێویستی بە چەورزمانی نیە› ۲. ڕازی؛ شوکرانەبژێر؛ ڕەزا؛ خۆشحاڵ و دڵنیا لە هەل‌ومەرجێ کە تێیدایە ‹او به همین حقوق قانع است: ئەو بەم مووچەیە ڕازیە›.

◘ **قانع شدن**: ۱. ڕازی بوون؛ نەرم بوون؛ ڕەزا بیەی ۲. قەناعەت هێنان؛ مل هاوردنە ڕاسە.

هەروەها: **قانع بودن؛ قانع کردن**

**قانقاریا** / qānqār(i)yā/: [معرب از یونانی]/اسم. قانقاریا؛ ڕەشە؛ سەقاملووس؛ مەرگی بەشێک لە شانەگەلی لەش بە هۆی پێ نەگەیشتنی خوێن، کوتران یان چلک‌کردن.

**قانون** / qānûn، ـها/: [معرب از یونانی]/اسم. قانوون: ۱. /قوانین/ پێودان؛ دەستوور؛ دەسوور؛ ڕێزک؛ داڵنگ؛ زاکوون؛ یاسە؛ یاسا؛ داب و نەریتێ کە بەڕێوەبردنی ئەرکی هەموو کۆمەڵگایە یان ڕێوشوێنێ بۆ کردەوە و کار کە ڕەسمی یان داسەپاو بێ ۲. /قوانین/ دەستوور؛ دەسوور؛ کۆی ئەم جۆرە داب و نەریت و ڕێوشوێنانە ‹قانون شرع: دەستووری شەرع› ۳. /قوانین/ دەربڕینی دۆزەنە و پێوەندی نێوان چەند دیاردە، کە لە ڕادەی زانینی ئێمەدا ناگۆڕدرێ ‹قانون بقا: قانوونی مانەوە› ٤. *[موسیقی]* ئامرازێکی کۆنی مووسیقایی بە ۲٦ تاڵ سیمەوە.

◘ **قانون اساسی**: دەستوور؛ قانوونێ کە جۆری حکوومەت، هێزە خاوەن دەسەڵاتەکان و ڕادەی ئەرک و دەسچوونی هەرکامیان دەسنیشان دەکات.

**قانون جزا**: قانوونی سزا؛ کۆمەڵە قانوونێ کە تاوان و سزاکانی دەسنیشان دەکا.

**قانون جنگل**: *[کنایی]* قانوونی جەنگەڵ: ۱. هەل یا دۆخی زاڵ بوونی زۆردار بە سەر بێ‌زۆردا ۲. هەرکە بۆخۆی؛ هەرکێ‌ـهەرکێ؛ زۆردار و بێ‌زۆر؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی قانوون و دەسەڵاتی هەمەلایەنەی زۆردار.

**قانون شرع**: قانوونی شەرع؛ قانوونێ کە ناوەرۆکی لە کتێبە دینیەکانەوە وەرگیراوە.

**قانون عرف**: قانوونی باو؛ قانوونی نەنووسراوی بەڕێوەچوو لە کۆمەڵگایەکدا.

**قانون مدنی**: قانوونی ژیوەر/ شارستانێتی؛ کۆمەڵە قانوونی سەر بە ماف و ئەرکی هەر کەس لە ئاست کۆمەڵگا و خەڵکدا.

**قانون همه یا هیچ**: ۱. *[فیزیولوژی]* قانوونێ کە دبێژێ شانی دەماری یان بە هەموو هێزەوە پەیامێ ڕادەگوێزێتەوە یان هیچ ناکا ۲. قانوونێ کە ئێژێ لە ئەزموونێکدا وەبیر هاتنەوە یان بە تەواوی ڕوو دەدا یا خۆ هەر ڕوو نادا * **اصل همه یا هیچ**

◘ **قانون را کشف کردن**: قانوون دۆزینەوە؛ ناسین و دەربڕینی پێوەندی نێوان دیاردەکان ‹مندل قانون وراثت را کشف کرد: مەندیل قانوونی

میرات‌بەری دۆزیەوە›.

**قانون گذاشتن** ☜ **قانون‌گذاری**

**قانون گذراندن:** قانوون دانان؛ ڕای قانوون سەندن.

**قانون وضع کردن:** قانوون دانان؛ ڕا لەسەردانی قانوون؛ پەسن‌کردنی قانوون؛ دەسوورەرە نیەی ‹مجلس قانون تازەای وضع کرد: ئەنجومەن قانوونێکی نوێی دانا›.

**قانوناً** / qānûnan/: [معرب/ عربی] *قید*. بە پێی قانوون؛ بەرامبەر بە قانوون؛ بەپێی یاسا ‹هر کس قانوناً مالک جان و مال خویش است: هەر کەس بە پێی قانوون خاوەنی گیان و ماڵی خۆیەتی›.

**قانون‌شکن** / qānûnšekan ، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] *صفت*. قانوون‌شکێن؛ بە تایبەتمەندی لە ژێر قانوون دەرچوون و گوێنەدان بە قانوون.

**قانون‌شکنی** / qānûnšekanî ، ـها/: [معرب/ فارسی] *اسم*. قانوون‌شکێنی؛ کار و ڕەوتی لە قانوون لادان.

**قانونگذار** / qānûngozār ، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی] *اسم*. قانوون‌داهێنەر؛ قانوون‌دانەر؛ دەستووردانەر.

**قانونگذاری** / qānûngozārî ، ـها/: [معرب/ فارسی] *اسم*. دەستووردانەری؛ قانوون‌دانەری؛ کار و ڕەوتی قانوون دانان.

**قانونمند** / qānûnmand/: [معرب/ فارسی] *صفت*. قانووندار؛ بەقانوون؛ پێبەند بە قانوون.

**قانونمندی** / qānûnmandî ، ـها/: [معرب/ فارسی] *اسم*. قانوونداری؛ بەقانوونی؛ پێبەندی بە قانوون.

**قانونی** / qānûnî/: [معرب] *صفت*. قانوونی؛ دەستووری؛ یاسایی: ۱. سەر بە قانوون ‹مصوبەی قانونی: پەسندکراوی قانوونی› ۲. هاوڕێ لەگەڵ قانوون ‹معاملەی قانونی: مامەڵەی قانوونی›.

**قاووت** / qāvût/: [ترکی] *اسم*. قاوت؛ قاویت؛ کاویت؛ پۆخین؛ ئاردی دەخڵی برژاو بە شەکر و بەهاراتەوە.

**قاهر** / qāher/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* زاڵ؛ چیر؛ چێر؛ چیرە.

**قاه ـ قاه** / qāhqāh/: [از عربی] *صوت*. *[گفتاری]* قا ـ قا؛ ترەقە؛ ترقە؛ تریقە؛ تریقەتریق؛ تریق و هۆڕ؛ تریق ـ تریق؛ پریقە؛ پریکەپریک؛ پریکە؛ پرکە؛ حیلکە ـ حیلکە؛ حیلکەحیلک؛ حیلکە؛ هنگ ـ هنگ؛ دەنگی پێکەنینی بەرز.

▣ **قاه ـ قاه زدن:** تریقانەوە؛ ترەقیان؛ تریقاندن؛ ترەقین؛ زەقین؛ زەقیان؛ حیلکانەوە؛ ئەوەقلیەی؛ قلەداونەی؛ قلهنگ؛ هنگ‌هوایش؛ دان لە قاقای پێکەنین؛ بە دەنگی بەرز پێکەنین.

**قاید** / qāyed ، ـان/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* پێشەوا؛ ڕێبەر؛ پێشەنگ: **قائد**

**قایش** / qāyeš ، ـها/: [ترکی] *اسم*. سیرم؛ سیرمە؛ زۆڵ؛ زۆڵە؛ زوێل؛ قایش؛ قاییش؛ قاریش؛ قەیش؛ قاویش؛ نەوارێکی باریک زۆرتر لە پەلاستیک.

**قایق** / qāyeq ، ـها/: [ترکی] *اسم*. لۆتکە؛ ناوە؛ بەلەم؛ کەڵە؛ قوفە؛ قەیک؛ قەیاخ؛ قایەق؛ ناوێکی گشتی بۆ هەموو جۆرە کەرەسەی پچووکی بە سەر ئاودا ڕۆ، کە زیاتر بە تاقە کەسێک بە ڕێوە دەچێ.

▣ **قایق بادبانی:** لۆتکەی بایەوانی؛ بەلەمی چارۆکەدار؛ لۆتکەیێ کە بایەوانی هەیە و بە هێزی با دەڕوا.

**قایق پارویی:** لۆتکەی پارۆیی؛ بەلەمی سەوڵی؛ لۆتکەیێ کە بە پارۆ لێدان بە سەر ئاودا دەڕوا.

**قایق موتوری:** لۆتکەی موتوری؛ لۆتکەیێ کە بە هێزی موتوڕ دەڕوا.

**قایق نجات:** لۆتکەی نەجات/ فریا؛ قایەقی زۆر سووک لە چێو یان ماکێکی وا کە بای تێ‌بکرێ، بۆ یارمەتی دان بە کەسانی نزیکەو خنکان.

**قـایقران / qāyeqrān** ، ـها؛ ـان/: [ترکی/ فارسی] /اسم. لۆتکەوان؛ قایقەوان؛ قەیاخەوان؛ بەلەمئـاژۆ؛ ئاژۆری بەلەم.

**قایقرانی / qāyeqrānî** ، ـها/: [ترکی/ فارسی]/اسم. لۆتکەوانی؛ قایقەوانی؛ قەیاخەوانی؛ کار و ڕەوتی ئاژۆتنی لۆتکە.

**قایـل / qāyel** ، ـان؛ ـین/: [عربـی]/اسم. [ادبی] ۱. ویـژەر؛ بێـژەر؛ بـوێژ ۲. بـە بـڕوا؛ بڕوامەنـد؛ بڕوادار * **قائل**

▣ **قایل بودن:** (به) بـڕوا بـوون؛ لـە سـەر بـاوەڕ بوون ‹او به هیچ دینی قایل نیست: کـابرا بـە هـیچ دینێک بڕوای نیە›.

**قایل شدن:** دانان؛ بڕیار دان؛ لە بەرچاو گـرتن ‹دبیـر مـا میـان بچـەهـا فـرق قایـل مـی‌شـود: مامۆسـتاکەمان لـە نێـوان منداڵـەکاندا جیـاوازی دادەنێ›.

**قایم[1] / qāyem** /: [عربی] صفت. ۱. [هندسه] قیـت لە سەر هێڵ یا ڕووپـەڕێک ۲. [ادبی] ڕاوەسـتاو؛ وەسـتاو؛ وێسـیاگ؛ وێسـاو؛ مـدرا * **قـائم** ۳. [گفتـاری] قـایم؛ شـاراوە؛ نادیـار؛ بـەرپیوار؛ سەخت ‹پولش را قایم کـرد: پارەکـەی قـایم کـرد› ٤. [گفتـاری] سـفت؛ گومـڕە؛ پتـەو؛ تـون؛ قـایم؛ پەیت؛ ڕێختە؛ گورخ؛ ئاستەم ‹بند کفشت را قـایم کن: بەنی کەوشەکەت سفت بکەوە›.

▣ **قایم شدن:** [گفتاری] خۆ شاردنەوە؛ قایم بوون؛ پەنامگێرتەی؛ وێ سەختکەردەی؛ بزر بـین؛ مەلخین؛ داشاریان.

**قـایم کـردن:** شـاردنەوە؛ لـێوەشـاردن؛ لێوەشارتن؛ داشـاردن؛ قـایمکـردن؛ سـەخت کەردەی؛ ئەوەشارتەی؛ شارایوە؛ تەقەتکردن؛ تاقەکردن.

**قایم[2]:** قید. [گفتـاری] بـە تونـدی؛ بـە سـەختی؛ ئاستەم؛ تون؛ تن ‹قایم خورد بـه دیـوار: بـە تونـدی کوترا بە دیوارەکەدا›.

**قایم الزاویه / qāyemozzāvîye** /: [عربـی] صفت. ڕاسـتگۆشـە؛ بـە سـووچێکی ۹۰ دەرەجـەوە: **قائم‌الزاویه**

**قایم‌باشک / qāyembāšak** /: [از عربی ؟/ فارسی] ☜ **قایم‌موشک**

**قایم‌مقام / qāyem.maqām** ، ـها/: [عربـی]/اسم. جێگر؛ نوێنەر؛ نایـب؛ کەسـێ کـە کـار و بـاری خـاوەن پایـەیێ لـە کـاتی نەبوونیـدا جێبـەجێ دەکا.

**قایم‌موشک/ qāyem.mûšak** /: [از عربی ؟/ فارسی] /اسم. چاوشـارکێ؛ چاوشـاریکێ؛ چاوشـارەکێ؛ قەرا_قەرا؛ قەرە_قەرە؛ قەرە_قەرێ؛ قەلە__قەلـە؛ قـەرێ__قـەرێ؛ ڤەشـارتوک؛ حەمـەگورگێ؛ کاکلەشێران؛ مڵاسەکوتێ؛ زۆپ_زۆپ؛ قولوولوو؛ چاوبەسێن_چاوبەسێن؛ چاوبەسێن_چاوبەسـیان؛ گەمەیەکی زارۆکانە بەم شێوە کـە یـەکیان بـەر چاوی خۆی دەگرێ و باقی خۆ دەشارنەوە، ئـەم جار ئەوەی چاوی بەستووە دەبێ پـێش ئـەوەی باقی بگەنەوە شوێنی چاوبەستنەکە پەیدایان بکا و قاویان با: **قایم باشک**

**قایمـــه / qāyeme** ، ـهـا/: [عربـــی]/اســـم. ۱. ئەستوندەک؛ ستووندەک؛ هەسوون؛ پاڵەوانە؛ کۆڵەکە ۲. ڕاستگۆشە: **قائمه**

**قبا / qabā** ، ـها/: [عربی]/اسم. کـەوا؛ قەڤـە؛ کـوا؛ کورتـەک؛ کورتـە؛ خفتـان؛ خـەفتان؛ کـەوێ؛ باڵاپۆشی ئاودامانی پیاوانە.

**قباحـــت / qabāhat, qebāhat** /: [عربـی]/اسم. ناحەزی؛ ناشیرینی؛ ناپەسندی؛ نەگونجاوی.

▣ **قباحت داشتن:** ناشیرین بوون؛ ناحـەز بـوون؛ دزێو بوون؛ ناپەسند بوون.

**قباد / qobād** /:/اسم. قوبـاد؛ جـۆرێ شێرماسـی: **ماهی قباد**

**قبـال / qebāl** /: [عربی]/اسم. بەرانبـەر؛ وەراوەر؛ وەرانوەر؛ بەرامبەر؛ هەمبەر؛ هنداف.

▣ **در قبال:** بەرانبەری؛ بەرامبەری؛ بەرانبەر بـە؛ لـە بەرامبـەر؛ لـە بەرانبـەری؛ لهەمبـەر؛

وەراوەروو؛ وەرانوەروو.

**قبالجات** / qabālecāt/: [عربی/ از عربی] جمعِ ☜ **قباله**

**قباله** / qabāle ، ـها؛ قبالجات/: [عربـی]/اسم. قەوالـە؛ قەبالـە: ۱. بەڵـگەی مڵـکی ۲. بەڵـگەی ژن و مێردی.

**قبایح** / qabāyeh/: [عربی]/اسم. [ادبی] کارگـەلی ناشیرین؛ کارانی ناحەز؛ کارگەلی دزێو.

**قبایل** / qabāyel/: [عربی] جمعِ ☜ **قبیله**

**قـبح** / qobh/: [عربـی]/اسم. [ادبی] ناشـیرینی؛ ناپەسندی؛ دزێوی؛ کەسنی.

**قبر** / qabr ، ـها؛ قُبور/: [عربـی]/اسم. قـەور؛ قـەبر؛ قەبرە؛ گۆڕ؛ گڵکۆ؛ گۆڕن؛ گەهـەر؛ تـرب؛ تـرپ؛ دەخمە؛ تا؛ تەو.

◘ **قبر سـرباز گمنـام** ☜ آرامگـاه سـرباز گمنـام، **آرامگاه**

**قبراق**[1] / qebrāq/: [ترکی] صفت. [گفتاری] تـەیار: ۱. بزێو؛ چالاک؛ لـەش‌سـووک؛ تاشـک؛ لۆپـت؛ لۆبت؛ زرت و زیندوو؛ زیت؛ گورد؛ گوربز؛ گـورج و گۆڵ ‹بچەی قبراق: مندالی بزێـو› ۲. بـەدەماخ؛ بەهێز؛ بەگوڕ؛ سەرکەیف؛ بەکـەیف؛ دەمـاخ؛ بـە گوڕ و تاو ‹هنوز اسب قبراقی است: هێشتا ئەسـپێکی بەدەماخە›.

**قبراق**[2]: قید. بە گوڕ و تاو؛ بـەگوڕ؛ بـەتاو؛ گیـف؛ گورج؛ کرژ؛ گورج و گۆڵ؛ کرژ و کۆڵ؛ ئازا؛ خێرا؛ بە توندی و چـالاکی؛ بـە تونـد و تیـژی ‹تـوی سربالایی قبراق می‌رفت: لە بەرەوژوورەدا بە گوڕ و تاو دەچوو›.

**قبرستان** / qabrestān ، ـها/: [عربی/ فارسـی]/اسم. قـــەبران؛ ســـەرقەبران؛ قەورســـان؛ قەورســـانە؛ قەورستان؛ سـەرقەوران؛ قەبرسـان؛ قەبرسـتان؛ زیارەتـان؛ زیـارەتلان؛ زیارەتـەلان؛ گۆڕسـتان؛ گۆڕسـان؛ شـاری خامۆشـان؛ مەڵـبەندی کفن‌پۆشان.

**قبـر کن** / qabrkan ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ۱. قەبرکەن؛ قەورکەن؛ گۆڕهەڵـکەن؛ قـەبرکۆڵ ۲. گۆڕهەڵـکەنە؛ چوالـو؛ کوڕەبەشـە؛ چالەکـە؛ گیانەوەرێکی گوانداری شەوگەڕە، دەم و پۆزەی درێـژ و لەشـی قـورس و ئەسـتوور و پێسـتی تووکنـە، کـون و شـاری مێـروو دەداتـەوە و دەیانخوا.

**قبض** / qabz/: [عربی]/اسم. ۱. [نامتداول] کـاری گرتن؛ سەندن ۲. /ـها؛ قبوض/ پسـووله؛ دڤـانەک؛ ڕەسید؛ قەوز؛ قەبز.

◘ **قبض انبار**: قەبزی هـەمار؛ پسـوولەی هـەمار؛ بەڵگەیێ کە نیشـاندەری هـاتنی کالایـێ بـو هەمارە.

◘ **قبض روح شدن**: [گفتاری] ڕۆح تـۆقین؛ زاڵـە تـرەکین؛ زاڵـەترەک بـوون؛ مـردن یـان نیوەگیان بوون لە ترسدا.

**قبضه** / qabze ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. قەبزە؛ قەبدە؛ یەکـەی ژمـاردنی جـەنگامێری دەسـتی (وەک شمشـێر و دەمانچـە) ۲. قەڤـد؛ قـەفت؛ قەبـدە؛ دەسکەی دەمانچە و خەنجەر و شـیر ۳. لـەپ؛ ناولەپ؛ نێودەست؛ ناومشت؛ پانایی چوار قامکی دەست.

◘ **قبضه کـردن**: [مجازی] تەختـەکردن؛ گرتنـە دەستەوە؛ دەست بە سەردا ڕاگرتن ‹او همـەی کارها را قبضه کرده است: (ئـەو) گشـت کارەکـانی تەختە کردووە›.

**قبطـی** / qebtî/: اسم. قیـبتی: ۱. نەتـەوەی دانیشتوانی کەونارای وڵاتی میسـر ۲. /ـها؛ ـان/ هەر کام لە خەڵکی ئەو نەتەوە ۳. لە زمانگـەلی حامی، زمانی کەونارای میسر.

**قبل**[1] / qabl/: [عربی] صفت. پـێش؛ بـەر؛ وەڵـین ‹چند صفحەی قبل: چەند لاپەڕەی پێش›.

**قبل**[2]: حرف. زووتر؛ پێشتر؛ بەر لە؛ وەروو؛ بەرای؛ وەڵوو؛ وەرتەر؛ بەرتر؛ وەڵتەر؛ وەرج؛ وەڵێ ‹قبل از تو بود: پێشتر لە تۆ بوو›.

◘ **قبل از ظهر**: پێش نیـوەڕۆ؛ بـەر لـە نیمـەڕۆ؛

وەڵێ نیمەڕۆی؛ وەڵۆنیمەڕۆی؛ بەرای نیمەڕۆ؛ پێش لە کاتژمێری ۱۲ی نیوەڕۆ.

**قبل از میلاد:** پێش زایین؛ بەرای زایین؛ پێشتر لە هاتنە دنیای حەزرەتی عیسا مەسیح.

**قبل / qebal/:** [عربی]/اسم. توانایی؛ هێز؛ هاز؛ هازی؛ تەشە؛ تابشت؛ کەلێژ؛ شێناهی؛ هەرەنگ؛ تەوان؛ شنگ؛ پێز.

◙ **از قبل:** بە یارمەتی؛ بە یاری؛ بە پشتیوانی؛ بە یاردەی ‹از قِبَل پولش به وزارت رسید: بە یارمەتی پارەی بوو بە وەزیر›.

**قبلاً / qablan/:** [عربی] قید. پێشووتر؛ پێشەتر؛ پێشان؛ لەوەو پێش؛ لەمەو پێش؛ زووتر؛ زووتەر؛ وەرتەر؛ وەڵتەر؛ چەلان؛ جاران؛ دە پێشیدا ‹قبلاً گفته بود که نمی‌آید: پێشووتر گوتبووی نایێ›.

**قبل‌منقل / qobolmanqal،** ـها/: [؟/ عربی]/اسم. *[گفتاری]* پیاڵە و ئیسکان؛ کەرەستەی چێشتخانە و ئاودارخانە بەتایبەت ئەوەی بۆ سەفەر و ناو ڕێ دەیبەن.

**قبله / qeble/:** [عربی]/اسم. ڕووگە: ۱. قیبلە؛ قیبلێ؛ قبلە؛ شوێنێ کە بۆ نوێژ ڕووی تێدەکەن (لای موسوڵمانان کەعبە لە شاری مەککەدا) ۲. *[کنایی]* جێ‌نیازان؛ کەسێ یان شوێنێ کە بۆ خەڵک جێگای سەرنج و ڕێزە.

◙ **قبله‌ی حاجات:** *[کنایی]* جێ نیازان؛ دەرگانەی ڕەحمەت؛ ئەوەی کە ئاتاجان بۆ پێداویستی خۆیان بەرەو لای دەچن.

**قبله‌گاه / qeblegāh/:** [عربی/ فارسی]/اسم. ڕووگە؛ قیبلە؛ قیبلەگەه ؛ قبلەگا؛ قیبلەگا.

**قبله‌نما / qeblenemā،** ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. قیبلەنوێن؛ قیبلەنما؛ ئامرازی نیشاندانی لای کەعبە.

**قبلی[1] / qablî/:** [عربی] صفت. پێشوو؛ بەرگین؛ وەڵین: ۱. بەرین؛ بەرگ ‹او دیگر آن آدم قبلی نبود: ئەو ئیدی ئەو مرۆڤەی پێشوو نەبوو› ۲. بەرێ؛ بەروو؛ لە شوێنێ پێش لەم شوێنە ‹خیابان قبلی: شەقامی بەرگین›.

**قبلی[2] /** ـها/: [عربی] ضمیر. پێشوو؛ بەرگین؛ وەڵین؛ ئەوەی کە پێش لە دیتر یان دیترانە ‹قبلی بهتر بود: پێشوو باشتر بوو›.

**قبور / qobûr, qubûr/:** [عربی] جمعِ ☜ **قبر**

**قبوض/ qobûz, qubûz/:** [عربی] جمعِ ☜ **قبض**

**قبول / qabûl/:** [عربی]/اسم. قەبووڵ؛ قوبووڵ؛ قەویل؛ کار و ڕەوتی وەرگرتن؛ هەڵگرتن؛ گلدانەوە ‹پول قبول نمی‌کند: پارە وەرناگرێ›.

◘ **قبول شدن:** دەرچوون؛ دەرهاتن؛ قەبووڵ بوون؛ هەڵبژێردران؛ پەژێران؛ وەرگیران ‹در کنکور قبول شد: لە کونکوور دەرچوو›.

**قبول کردن:** وەرگرتن؛ قەبووڵ کردن؛ گلەودایین؛ هەڵگرتن ‹پیشنهادم را قبول کرد: پێشنیارەکەمی وەرگرت›.

**قبولاندن / qabûlandan/:** [عربی/ فارسی] مصدر. متعدی. // **قبولاندی:** سەلماندت؛ **می‌قبولانی:** دەسەلمێنی؛ **بِقبولان:** بسەلمێنە// سەلماندن؛ سەلەمنەی؛ سەلەمنای؛ قەبوولاندن؛ قبلاندن؛ قەبیلاندن؛ پێ‌پەژیراندن.

■ **صفت مفعولی: قبولانده** (سەلمێنراو)

**قبولی[1] / qabûlî/:** [عربی]/اسم. قەبوولی؛ کار و ڕەوتی پەزیران؛ وەرگرتن ‹لطفاً قبولی دعوت را اطلاع دهید: تکایە پەزیرانی داوەتەکە ڕاگەیێنن›.

**قبولی[2]:** *صفت.* دەرچوو؛ قەبووڵ‌بوو؛ قەبووڵ‌کراو؛ وەرگیراو؛ پەژێراو. بەرانبەر: رَدّی ‹نامش در میان قبولی‌ها نبود: ناوی لە نێوان دەرچووەکاندا نەبوو›.

**قبه / qobbe،** ـها/: [عربی]/اسم. ۱. قوب؛ قوبە؛ گومەز؛ هەوق ۲. قوبکە؛ قوپکە؛ تۆپەڵ؛ هەر چی لە بیچمی گومەز بێ ۳. قوپچە؛ قوپکە؛ پشکووژ ٤. گومەز؛ گومبەز؛ گومەزە؛ گومەزی سەر قەبر ٥. *[قدیمی]* چەق؛ ناوەڕاست؛ جەرگە.

**قبیح / qabîh/:** [عربی] صفت. *[ادبی]* دزێو؛ نەچێ؛ ناپەسن؛ ناشیرین؛ قۆڕ ‹کارِ قبیح: کاری دزێو›.

**قبیحه / qabîhe/:** [عربی] صفت. ناشیرین؛ دزێو؛

نەگونجاو؛ نەچێ؛ نەباش.

**قبیل** / qabîl/: [عربی]/اسم. جۆر؛ چەشن؛ وێنە ‹این قبیل کتابها: ئەم جۆرە کتێبانە›.

**قبیله** / qabîle، ـها؛ قبایل/: [عربی]/اسم. قەبیلە؛ بەرەباب؛ تیرە؛ ئێل؛ خێڵ؛ عێل؛ ماکاش؛ خێڵەسات؛ تاقمێ لە خەڵکی کە زاراوە، داب و نەریت و دەستووری هاوبەشیان هەیە و لە یەک پشتن و لە ناوچەیەکدا دەژین.

**قبیله‌ای** / qabîle'î/: [عربی] صفت. خێلاتی؛ ئێلی؛ خێڵی؛ قەبیلەیی؛ قەویلەیی؛ تیرەیی ‹جنگ قبیله‌ای: شەڕی خێلاتی›.

**قپان** / qapān، ـها/: [از لاتینی]/اسم. گرانکێش؛ قەپان؛ قەپانە؛ قاپان؛ جۆرێ تەرازوو بۆ کێشانی شتی گەورە یان قورس.

**قپاندار** / qapāndār، ـها؛ ـان/: [از لاتینی/ فارسی]/اسم. قەپانچی؛ قەپاندار؛ خاوەن‌قەپان؛ کەسێ کە شت لە قەپان دەدا. هەروەها: **قپانداری**

**قپه** / qoppe/: [از عربی]/اسم. *[گفتاری]* قوپکە؛ نیشانەیەکی پلەکی چەکداری، لە بیچمی هەسارەی هەشت‌پەل.

**قپی** / qopî، ـها/: [؟]/اسم. *[گفتاری]* لاف؛ گەزاف؛ شات‌وشووت؛ بافیش؛ فشە.

▣ **قپی آمدن:** بە قسە ئالی زەنگان و بە کردەوە ڕیخ لە لنگان بوون؛ لافوگەزاف لێدان؛ خۆ هەڵکێشان؛ هەڵشڵنگاندن؛ شات و شووت کردن.

**قتال** / qattāl/: [عربی] صفت. *[ادبی]* کوژەر؛ کوشندە؛ کشتۆخ؛ بکوژ.

**قتال** / qetāl/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کوشت و بڕ؛ کوشت و کوشتار.

**قتل** / qatl، ـها/: [عربی]/اسم. قەتڵ؛ خوێن؛ ونی؛ قەتڵە؛ کاری کوشتن نەخوازە کوژتنی مرۆ.

▣ **قتل عام:** گەل‌کوژی؛ کۆکوژی؛ کۆمەڵ‌کوژی؛ کوشتاری بە کۆمەڵ.

**قتل عمد:** دەسانقەست کوژی؛ کوشتنی بە قەست. بەرانبەر: **قتل غیرعمد**

**قتل غیرعمد:** کوشتنی نادەسانقەست؛ کوشتنێ کە لە کوت‌وپڕا و بەبێ ویستی پێشوو ڕوو بدا. بەرانبەر: **قتل عمد**

**قتل نَفس:** کوشتنی گیاندار.

▣ **قتل کردن:** کوشتن؛ قەتڵ‌کردن؛ خوێن‌کردن.

**قتلگاه** / qatlgāh، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. کوشتنگە؛ شوێنی کوژران/ کوشتن.

**قتله** / qatale/: [عربی] جمعِ ☜ **قاتِل**

**قحبه** / qahbe، ـها؛ ـگان/: [عربی]/اسم. *[مستهجن]* بڤکێ؛ قەحبە؛ بەستۆک؛ سۆزانی؛ جندە؛ جوونە؛ گوزلی؛ دەویت؛ بەدناو.

**قحط** / qaht/: [عربی] صفت. قات؛ قەحت؛ کولپ؛ قات‌وقڕ.

▣ **قحط بودن:** قات بوون؛ قەحت بوون؛ نەبوون؛ قەت بوون ‹مگر کار قحط بود رفتی سراغ دستفروشی؟!: ئەرێ قات کار بوو بوویە دەسفرۆش؟!›.

**قحط‌الرجال** / qahtorrecāl/: [عربی]/اسم. قاتەپیاو؛ پیاوقاتی؛ دۆخی دەس نەکەوتنی پیاوی شیاو.

**قحط‌سالی** / qahtsālî/: [عربی/ فارسی]/اسم. وشکەسالی؛ قات‌سالی؛ ڕەشەسالی؛ سیاسالی؛ هشکسالی؛ ئیشکەسالی.

**قحطی** / qahtî، ـها/: [عربی]/اسم. کولب؛ کولپ؛ قاتی؛ قڕی؛ قات و قڕی؛ قاتی و قڕی؛ خەلا؛ قتی؛ مەلی؛ تومین؛ قاتەلێو؛ گرانی (بەتایبەت خواردەمەنی).

**قحف** / qehf/: [عربی]/اسم. لاتەوێڵ؛ هەر کام لە دوو ئێسکی لاپالی تەوێڵ.

**قد** / qad(d)، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. بالا؛ بەژن؛ قام؛ قەد؛ قەو؛ قەی؛ ئەخد؛ ئەقد؛ چڵ ‹قد بلند: بالا بەرز› ۲. *[گفتاری]* ئەندازە؛ ئەنازە؛ ئەناز؛ شۆ؛ بارست؛ بارسا؛ گۆرەبا؛ ڕەی؛ چاپان؛ تیەن؛ ڕادە ‹حیاطش قد یک قدم بود: حەوشەکەی ئەندازەی

هەنگاوێک بوو›.

▣ **قد دادن**: پـێ‌شـکان؛ پێگەیشـتن؛ شـکان؛ برکردن؛ یاوای ‹عقلش قد نداد خانەاش را نگه دارد: عەقڵی پێ نەشکا ماڵەکەی ڕاگرێ›.

**قد علم کردن**: *[مجازی]* وەستانەوە؛ وێسیانەوە؛ ڕاستەوە بـوون؛ بـەرەنگار بوونـەوە؛ ئامـادەی بەربەرەکانێ بـوون ‹آزاد تنها کسی بود که در برابرش قد علم کرد: ئـازاد تاقـە کەسـێک بـوو لـە بەرامبەریدا وەستایەوە›.

**قد کسی/ چیزی بودن**: بـە قـەد/ قـەو/ قـەی کەسێ/ شـتێ بـوون؛ ئینـەو یـۆی/ چێوێـوی بیـەی؛ لـە ڕادەی کەسـێ/ شـتێکدا بـوون؛ ئەوەندەی کەسێک/ شتێک بوون ‹شکمش قد یک بشکه بود: زگی بە قەد بەرمیلێک دەبوو›.

**قـد کسـی/ چیـزی را گـرفتن**: بـەژن/ بـاڵای کەسـێ پێـوان؛ ئەنـدازەگرتن؛ قـەد/ قـەوی کەسێ/ شتێ‌گرتن؛ قام‌کرن ‹قد آرام را گرفت، کمـی از آزاد بلنـدتر اسـت: بـەژنی ئـارامی پێـوا، هێندێک لە ئازاد بەرزترە›.

**قد کشیدن**: باڵاکردن؛ هەڵچوون؛ بـەرز بـوون؛ درێژ بوون؛ بەرز بیەی؛ قەبلین (بۆ ڕوەک) ‹در این یک سال چقدر قد کشیدەای!: لـەم یـەکساڵـە چەندت باڵا کردووە!›.

**قد** / qod(d)، ـها: *صفت. [گفتاری]* قوڵـم؛ قیـت؛ قوت؛ جک؛ سەرشەق؛ کەمۆت؛ سـەرڕەق؛ مقڕ؛ لابەلا؛ گەدگیر ‹یارو خیلی قُد بود و کوتـاه نمـی‌آمـد: کابرا زۆر قوڵم بوو، دەستی هەڵنەدەگرت›.

**قداره** / qaddāre، ـها: [سنسکریت] *اسم.* قـەدارە؛ غـەدارە؛ قەسـەتۆرە؛ قەمـە؛ کـەتارە؛ جـۆرێ شمشێری کورت و دەم پان.

**قدارەبند** / qaddāreband، ـها؛ ـان: [سنسکریت/ فارسی] *صفت.* ۱. قەدارەبەن؛ کەتارەکێش؛ کەسێ کە کەتارە لەگەڵ خۆی هەڵـدەگرێ ۲. *[کنایی]* زۆربێژ؛ زاڵم؛ مارِز.

**قداست** / qedāsat, qadāsat، ـها: [عربـی] *اسم.* پیرۆزی؛ مومبارەکی؛ هورمی؛ پاکی.

**قدامی** / qodāmî: [عربی] *صفت. [ادبی]* بـەروو؛ پێشوو؛ بەرگین؛ وەرین؛ وەڵین؛ لە بـەرەوە؛ لـە پێشەوە ‹استخوان قدامی: ئێسکی پێشوو›.

**قدبلنـد** / qadboland، ـهـا؛ ـان: [عربـی/ فارسـی] *صفت.* بالابەرز؛ بەژن‌بەرز؛ کەڵەگەت؛ بەژن‌بڵـند؛ بلندبالا؛ بالابلند؛ شـاگە؛ شـیک؛ قۆڵـێ؛ کیـف؛ درێـژن؛ درێـژە؛ شـووش و لـەبار و بـەژن‌زراف. بەرانبەر: **قدکوتاه**

**قدح** / qadah، ـها: [عربی] *اسم.* ۱. بایـە؛ باییـە؛ بادیـە؛ جـامی گـەورە ۲. ئـەوەی لـە نـاو ئـەو دەفرەدایە ۳. پێک؛ پیک؛ پیاڵەی شەراب.

**قدح** / qadh: [عربـی] *اسم. [ادبی]* خراپـەوێژی؛ ڕەوتی ناو زڕاندن؛ خراپەگوتن. بەرانبەر: **مدح**

**قـــدر**[1] / qadar: [عربـــی] *اســم.* چـــارەنووس؛ چـــارەنویس؛ ناوچـــاو؛ تەقـــدیر؛ سەرنڤشـــت؛ سەرنڤیشت؛ بەخت و هات؛ چارەنڤیس.

**قدر**[2] / ـها: [عربی] *صفت. [ورزش]* بـەهێز؛ توانـا؛ نەبەز؛ گورێخ؛ گورخ.

**قدر** / qadr: [عربی] *اسم.* قەدر؛ قـەیر: ۱. *[ـها]* ڕادە؛ قاس؛ هێند؛ هەند؛ حەد ۲. بایەخ؛ ئەرزش؛ ڕێـز؛ شـیاوی؛ هێژایـی ۳. *[نجـوم]* ئەنـدازەی درەوشاوەیی تەنێکی ئاسمانی.

▣ **قدر مسلّم**: ئەوەی ڕاستی بـێ؛ بـێ‌شـک؛ بـە دروستی ‹قدر مسلم آن است که کار به ایـن زودی تمام نمی‌شود: ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەیـە کـار بـەم زووانە کۆتایی نایێ›.

▣ **قدر دانستن**: قەدر زانین؛ پـێ‌زانـین؛ قـەدری کەسێ یـان شـتێک زانـین. هـەروەها: **قدر شناختن**

**قدرت** / qodrat، ـهـا: [عربـی] *اسم.* دەسـەلات؛ دەستەلات؛ کەلێژ؛ کەلیژ؛ توان؛ تەوان؛ توانـایی؛ ستین؛ شنگ؛ هێز؛ هاز؛ تاقەت؛ قووەت؛ قۆرەت؛ هـەرەنگ؛ هـورمێن؛ تەشـە؛ دەگـەر؛ برسـت؛ توانست؛ برە ؛ هـازی؛ نیرەوان؛ ڤـەژەن؛ گـوڕ؛

هیل؛ حێل: ۱. توانستی جێبەجێ کردنی کارێ یان کار تێکردن ‹قدرت تکان خوردن نداشت: دەسەلاتی جوولانەوەی نەبوو› ۲. دۆخ یان چۆناوچۆنی زاڵ بوون یان بەرەودار بوون ‹او با قدرت، همه را اداره می‌کرد: بە زەبر، هەمووی دەگەڕاند› ۳. *[سیاسی]* دەولەتێ کە وەها زاڵیەتی یان کارتێکریەکی هەیە ‹قدرت‌های منطقە: هێزەکانی ناوچە› ٤. تین؛ تاو؛ ورە؛ تابشت؛ تاوش؛ دەست و دوو.

▣ **قدرت تجسم**: توانایی هێنانە بەرچاو و وێنا کردن.

**قدرت‌پرستی** / qodratparastî، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. دەسەلات‌پەرستی.

**قدرت‌طلبی** / qodrat.talabî، ـها/: [عربی]/*اسم*. دەسەلاتخوازی. هەروەها: **قدرت‌طلب**

**قدرتمند** / qodratmand، ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت*. هۆمام؛ پرزوو؛ توانا؛ بەهێز و توان؛ بەهێز و تابشت؛ دەسەلاتدار؛ دەس‌ڕۆیشتوو.

**قدرت‌نمایی** / qodratnemāyî، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. دەسەلات‌نوێنی؛ قۆرەت‌نوێنی؛ کار یان ڕەوتی نواندنی دەسەلات و هێز بۆ ترساندن.

**قدردان** / qadrdān/: [عربی/ فارسی] *صفت*. قەدرزان؛ قەدردان؛ پێزان.

**قدردانی** / qadrdānî، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. ڕێزگری؛ پێزانی؛ ڕەوتی خەمناندن.

**قدرشناسی** / qadršenāsî، ـها/: [عربی/ فارسی] /*اسم*. پێزانی؛ قەدرناسی؛ ئەمەگداری. هەروەها: **قدرشناس**

**قدرقدرت** / qadarqodrat، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت*. زل‌هێز؛ لێهاتوو بۆ بەرەنگاری چارەنووس.

**قدرنشناسی** / qadrnaš(e)nāsî، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. سپلەیی؛ سفڵەیی؛ ناسپاسی؛ هەق‌نەناسی؛ ئەمەگ‌نەناسی؛ پێ‌نەزانی. هەروەها: **قدرنشناس**

**قدروقیمت** / qadr-o-qeymat, qadr-o-qîmat/: [عربی]/*اسم*. بڕ؛ ڕێز؛ وەج؛ حورمەت؛ ئەرزشت.

**قدری** / qadarî/: [عربی] *صفت*. جەبری؛ بڕوامەند بە چارەنووس.

**قدری** / qadrî/: [عربی] *ضمیر*. هێندێک؛ هەندێ؛ قەدەرێک؛ بڕێ؛ بڕێک؛ چەندێتیەکی وا کە زۆر یان کەمی دیار نەبێ ‹قدری آب خوردم: هێندێک ئاوم خواردەوە›.

▣ **به قدری**: هێندە؛ زۆرزۆر؛ یەکجار؛ ئێجگار؛ تا ڕادەیەکی زۆر ‹بە قدری زیبا بود کە از گفتن نمی‌آید: هێندە جوان بوو لە وتن نایە›.

**قدس** / qods/: [عربی]/*اسم*. پاکی؛ بێ گوناهی؛ هورمی؛ پیرۆزی؛ ممبارەکی؛ پاک و پواری؛ بێ‌خەوشی.

**قدس سره** / qoddesaserroh/: [عربی] *دعا*. نوور لە قەبری بباری؛ ڕەحمەت لە قەبری؛ گۆڕی پیرۆز بێ.

**قدسنج** / qadsanc، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. بەژن‌پێو؛ بالاپێو؛ ئامرازی ئەندازەگرتنی بەژن و بالا.

**قدسی** / qodsî/: [عربی] *صفت*. پاک؛ هورم؛ پیرۆز؛ هەزەخ؛ ممبارەک.

**قدغن** / qadaqan/: [ترکی] *صفت*. قاخە؛ قەدەغە؛ قەدەخە؛ ڕێ‌نەدراو؛ بەند؛ بەندە؛ یاساخ؛ یەساخ ‹ورود خارجیان را قدغن کرد: هاتنی لاوەکیانی قاخە کرد›.

▣ **قدغن کردن**: هەماندن؛ قەدەغەکردن؛ قاخە کردن؛ قۆرغ‌کردن؛ پاوان‌کردن؛ یاساخ کردن. هەروەها: **قدغن بودن؛ قدغن شدن**

**قد ـ قد** / qodqod/: *صوت*. قدەقد؛ قرتەقرت؛ دوورقەدوورق؛ قد ـ قد؛ قید ـ قید؛ قوت ـ قات؛ دەنگی مریشک.

**قدک** / qadak/: *اسم*. قەدەک؛ قوماشێکی دەسچنی ڕەنگامەیە زۆرتر لە پەموو.

**قدکوتاه** / qadkûtāh/: [عربی/ فارسی] *صفت*.

کۆتەڵ؛ بالابچووک؛ کورت؛ کورتەبالا؛ کەمبالا؛ کۆتابالا؛ کوڵ؛ کولَندە؛ کولندە. بەرانبەر: **قدبلند**

**قدم** / qadam ، ـها/: [عربی]/اسم. پێ؛ پا: ۱. /اَقدام؛ قُدوم/ پەی ‹از سر تا قدم: لە سەر تا پێ› ۲. هەنگاو؛ هەنگام؛ گۆم؛ گام؛ گاڤ؛ شاقا؛ شاقاو؛ شاقام؛ شەقاو؛ شەقام؛ شەقا؛ لاقۆرە؛ پێگاڤ؛ پێنگاڤ؛ پێنگاو؛ گامە؛ هنگاو؛ هنگاڤ؛ هەنگاڤ؛ گاو؛ قوڵەنج؛ قام؛ قاو؛ لۆقاو؛ لۆق؛ قەدەم ‹صد قدم فاصله داشت: سەد هەنگاو دوور بوو›.

◻ **قدم به قدم:** [مجازی] وردە- وردە؛ هەنگاو بە هەنگاو؛ ڕێزە-ڕێزە؛ قۆناغ-قۆناغ؛ قەدەم بە قەدەم.

◻ **قدم از قدم برنداشتن:** [مجازی] هەنگاو نەنیان؛ پا هەڵنەگرتن؛ پا نەگۆزانەوە؛ جم نەخواردن؛ تەکان نەخواردن؛ ڕێ نەچوون؛ لە جێی خۆ مانەوە؛ پا نەنیای ‹من دیگر قدم از قدم برنمی‌دارم: ئەمن چیدی هەنگاو نانیم›.

**قدم تند کردن:** پا هەڵخستن؛ پا هەڵگرتن؛ بە پەلە چوون؛ توند چوون؛ ئازا کردن ‹قدم تند کردم به او برسم: پام هەڵخست پێی بگەم›.

**قدم رنجه فرمودن:** [مجازی] تەشریف هێنان؛ هاتن (بۆ خێراتنی میوان دەگوترێ).

**قدم زدن:** پیاسەکردن؛ پیارسەکردن؛ قەدەم لێدان؛ قام لێدان؛ ڕێڤە چۆن؛ لوە ڕانەی؛ گاڤ دان؛ هێدی- هێدی ڕێوە چوون بۆ وەرزش، گەڕان یان هێور بوونەوە.

**قدم کسی خوب بودن:** پای کەسێک خێر بوون؛ پای کەسێ خاس بوون.

**قدم کسی سبک بودن:** [مجازی] پای کەسێک سووک بوون: ۱. قەدەمی کەسێک خێر بوون ۲. هاتنی کەسێک بوونە هۆی بەرەو پێدرانی شوێنێ. بەرانبەر: **قدم کسی سنگین بودن**

**قدم کسی سنگین بودن:** [مجازی] پای کەسێک قورس بوون؛ هاتنی کەسێک بوونە هۆی لە بەرەوکەوتنی شوێنێ. بەرانبەر: **قدم کسی سبک بودن**

**قدم کسی شور بودن:** [مجازی] پای کەسێ خراپ بوون؛ پای کەسێک بێخێر بوون؛ بە هاتنی کەسێ، کەس یان کەسانی تر لەوێ تاران.

**قدم گذاشتن:** هاتنە ناوەوە؛ پا نیەی/ نیای.

**در قدم کسی افتادن:** کەوتنە سەر/ مل پای کەسێکدا.

**سر قدم رفتن** ☜ **سر**[۳]

**قدم** / qedam/: [عربی]/اسم. کۆنی؛ پێشینەیی.

**قدما** / qodamā/: [عربی] ضمیر. پێشینیان؛ پێشینان؛ وەڵینا؛ وەرینان؛ قەدیمیێ؛ خەڵکی ڕۆژگارانی زوو.

**قدمت** / qedmat/: [عربی]/اسم. کۆنەیی؛ کۆنی.

**قدم‌رو** / qadamrow/: [عربی/ فارسی]/اسم. [نظامی] کەوتنەڕێ یان هەنگاو نان بەڕێکوپێکی و نەزمەوە.

**قدم‌زنان** / qadamzanān/: [عربی/ فارسی] قید. بە پیاسە؛ وە پا؛ بە پێ؛ بە پا؛ بە پەی؛ بە دەم ڕێوە.

**قدم‌زنی** / qadamzanî/: [عربی/ فارسی]/اسم. [گفتاری] پیارسە؛ پیاسە؛ گاڤان؛ کاری بەڕێگەدا چوون.

**قدمگاه** / qadamgāh ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. جێ‌پێ؛ جێگەپا؛ یاگەپا؛ جێگای پا نیان بەتایبەت جێ‌پای کەسێکی پیرۆز.

**قدوس** / qoddûs, quddûs/: [عربی] صفت. [ادبی] هورم؛ پیرۆز؛ ممبارەک؛ دوور لە گوناح و خراپی.

**قدوم** / qodûm, qudûm/: [عربی] جمعِ ☜ **قدم**

**قدومه** / qodûme, qudûme ، ـها/: اسم. وردینەک؛ وردینە؛ وەروینک؛ شیرڕێژ؛ گیایەکی ئالفی خۆگر بە گوڵی سپی درشت و دەنکی لیقنەوە کە لە گیادەرمانیدا بە کار دێ.

**قد و نیمقد** / qad-o-nîmqad ، ـها/: [عربی/ فارسی/ عربی] صفت. ورد و درشت؛ گەورە و گولانە؛

گەورە و گچکە؛ گەورە و بچووک ‹بچەهای قد و نیمقد: مندالانی ورد و درشت›.

**قدی** / qaddî/: [عربی] *صفت.* ١. تەواوبالا؛ بالاپیاو ٢. بـالانوێن؛ بالانـەما ‹آیینـەی قـدی: ئاوێنـەی بالانوێن›.

**قدی** / qoddî، ـها/: *اسم. [گفتاری]* قولمی؛ قوتی؛ قـیتی؛ تێکـی؛ جکـی؛ سەرشـەقی؛ سـەرڕەقی؛ لابەلایی؛ خرسی ‹پسرم این همه قُدّی درست نیست: کوڕی خۆم هێندە قولمی باش نیە›.

**قدیـد** / qadîd/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* قاورمـە؛ گوشتی سوورەوەکراوی هەڵگیراو بۆ تفاق.

**قـدیس** / qeddîs، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی] *صفت.* یارسان؛ پـیر؛ وەلی؛ خـاوەن پێوەنـدی دەگـەڵ خوا، فریشتە یان هێزی ئاسمانیدا.

**قدیسـه** / qeddîse، ـهـا؛ ـگـان/: [عربـی] *صفت.* یارسان؛ کچ یان ژنی خـاوەن پێوەنـدی لەگـەڵ خوا و فریشتەکانیدا.

**قدیفه** / qadîfe/: [از عربی] ☜ **قطیفه**

**قدیم** [1] / qadîm/: [عربـی] *صفت.* ١. کۆن؛ کەونارا؛ قەدیم؛ قەییم؛ سابق؛ ئەوسا؛ زوو؛ پێشوونە ‹زمان قـدیم: سـەردەمی کـۆن› ٢. *[فلسـفه]* هـەربوویی؛ ئەزەلی؛ بێسەرەتا. بەرانبەر: **مُحْدِث**

**قدیم** [2] / ـها/: *قید.* ئەوسا؛ ئەوسـاکە؛ جـاران؛ زوو؛ چەلان؛ ئەوجا؛ ئەوگا؛ قەدیم؛ لـە کۆنـدا؛ جـاری جاران ‹قدیم مـردم از نعمـت سـواد برخـوردار نبودنـد: ئەوسا خەڵکی سەوادیان نەبوو›.

**قـدیمالایـام** / qadîmol'ayyām/: [عربـی] *اسـم.* ڕۆژگاری ڕابردوو؛ زەمانی کۆن؛ قەدیم.

**قـدیمونـدیم** / qadîm-o-nadîm، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] *اسم. [گفتـاری]* ڕابـردووی کـۆن؛ کـەونارا؛ جاری جاران ‹اینجا از قدیم و ندیم گذرگاه بوده: ئێرە لە ڕابردووی کۆنەوە بوارگە بووە›.

**قدیمها** / qadîmhā/: [عربی/ فارسی] *قید. [گفتـاری]* جاران؛ لە ڕابردوودا؛ زوو؛ ئەوسا ‹قدیمها تلویزیـون نبود: جاران تەلەڤزیۆن نەبوو›.

**قدیمی** / qadîmî، ـها/: [عربی] *صفت.* قـەدیمی؛ قەیمی؛ کۆنـە؛ کوهـۆن؛ کـۆن؛ کەڤـن؛ دێـرین؛ کەعن؛ کان؛ کەون؛ کەهەن؛ لە مێژینە.

**قر** / qer، ـها/: *اسم.* قر؛ قروفر؛ قـەلبیر؛ قـەلبیرە؛ تەکان و پێچ و قەمچێ کە بۆ سەرنج ڕاکێشـانی دیتـران بەتایبـەت لـە هەڵـپەڕکێدا بـە لەشـی دەدەن.

▣ **قر شتری:** *[مجازی]* کەر ناز؛ سوور و خولـدانی نەزانانە و ناشیرینی لەش.

▣ **قر دادن:** قر دان؛ قنگ بادان؛ سوور دان؛ وێ شۆکنایوە؛ بۆ سەرنج ڕاکێشانی دیتران لەشـی خۆ پێچ و قەمچ دان.

**قـر** [1] / qor/: *اسـم* قـۆرە؛ بۆڵـە؛ پرتـە؛ بۆڵـەبۆڵ؛ قۆڕەقۆڕ؛ قوتەوبۆڵە؛ پرتەوبۆڵە.

**قر** [2]: *صفت.* ١. قۆڕ؛ قیرە؛ قیڕە ٢. تەپق؛ قوپاو.

▣ **قر زدن:** *[کنایی]* نیشـتنە ژێـر پـا؛ هەڵـگرتن؛ هۆرگێرتەی؛ فریو دانی کەسێک و بـردنی بـۆ جێگایێک یان ڕاکێشـانی بـۆ لای خـۆ ‹حـالا دیگر زن و دختر مردم را قر میزنی؟!: ئێستا وات لێ هاتووە ئەنیشیتە ژێر پای ژن و کچی خەڵک؟!›.

**قر شدن:** *[گفتاری]* ١. قیڕە بـوون؛ قـۆڕ بـوون/ بیەی ٢. قوپـان؛ قوپیـان؛ قوپیـەی؛ قوپیـای؛ قۆپان؛ قوبان؛ کووپان؛ تەپقین؛ ڕۆچوون.

**قر کردن:** قوپاندن؛ قوباندن؛ قۆڕکردن.

**قرا** / qorā/: [عربی] ☜ **قُری**

**قراء** / qorrā'/: [عربی] جمعِ ☜ **قاری**

**قرائت** / qarā'at، ـها/: [عربی] *اسم.* ١. کـار یـان ڕەوتی خوێندنـەوە ‹قرائـت قـرآن: خوێندنـەوەی قورئان› ٢. *[مجازی]* خوێندنەوەی بە دەنگی بەرز ٣. بۆچوون؛ خوێندنەوە؛ تێگەیشتنی مـرۆڤ لـە بابەتێکی فیقهی یان حقووقی ‹او قرائت تـازەای از آزادی عرضه کرده است: ئـەو بۆچـوونێکی تـازەی لـە ئازادی هێناوەتە ئاراوە›.

**قرائتخانـه** / qarā'atxāne، ـها/: [عربـی/ فارسـی] *اسم.* خوێندنگـە: ١. جێگایـەکی گشـتی بـۆ

خوێندنەوە ۲. دیوی خوێندنەوە لە کتێبخانەدا.
**قرائن** / qarā'en/: [عربی] ☜ **قراین**
**قرابادین** / qarābādîn/: [معرب از یونانی]/اسم. *[قدیمی]* قرابادین؛ کتێبی دەواناسی کە تایبەتمەندی دەرمان و ڕێژە و شێوەی بە کار بردنی زۆر دەوای تێدا نووسراوە.
**قرابت** / qarābat، ـها/: [عربی]/اسم. نزیکی؛ نێزیکی: ۱. دۆخی نزیک بوون؛ بەرامبەری دووری ۲. خزمایەتی؛ قەومایەتی.
◙ **قرابت سببی:** ژن و ژنخوازی؛ پەیڤەن؛ خنامی؛ خزمایەتی لە ژن خواستن و شوو کردنەوە بەدیهاتوو.
**قرابت نسبی:** خزمایەتی خوێنی (لە دایک و بابەوە).
**قرابه** / qorābe، ـها/: اسم. قەڕابە؛ قوڕابە؛ دەفری گەورەی مل درێژ و دەمتەنگی شووشەیی.
**قراد** / qorād، ـها/: [عربی]/اسم. کرنگ؛ قرنوو؛ قرنە؛ کرنوو؛ کرنی؛ قرنی؛ کەولە؛ مێروویەکی پانکەلەی سوورە بە ئاژەڵەوە دەنووسێ.
**قرار** / qarār/: [عربی]/اسم. قەرار: ۱. بنەجێ؛ جێگیر؛ بنەگیر؛ ڕەوتی مانەوە؛ بوون؛ ئەوەمەنەی ‹قرار داشتن؛ قرار دادن: بنەجێ بوون؛ جێگیر کردن› ۲. /ـها/ بڕیار؛ بەڵێن؛ وەعد ‹قرار گذاشتیم هر جمعه برویم کوه: بڕیارمان دا هەموو هەینییەک بڕۆین بۆ کێو› ۳. ژوان؛ ژوانگە؛ جێژوان ‹دیروز سر قرار حاضر نشد: دوێنێ نەهاتە سەر قەرار› ٤. بڕیار؛ بەڵێن؛ پەیمان ‹قرار کفالت: بڕیاری سەرپەرستی› ٥. چۆنیەتی؛ چۆناوچۆنی؛ چلۆنایەتی ٦. قەرا؛ هەدا؛ هێدان؛ هەدان؛ ئۆقرە؛ وەقرە؛ ئۆخژن؛ هەراس؛ توتکە؛ تویتکە؛ دابین ‹آرام و قرار ندارم: ئۆقرە و ئارامم نیە›.
◙ **از قرار معلوم:** وا دیارە؛ ئەو جۆرە کە دیارە؛ وا دەردەکەوێ؛ ئاوا کە دیارە؛ پاسە دیارا؛ پاسە مشۆشەوە ‹از قرار معلوم برنمی‌گردد: وادیارە ناگەڕێتەوە›.
**به قرار زیر:** وەها؛ بەم جۆرە؛ ئاوا؛ ئاوەها؛ ئاوها؛ پیسە؛ ئەپێسە؛ پێجۆرە؛ بەو جۆرە.
◙ **قرار بودن:** بڕیار وابوون؛ قەرار بوون ‹قرار بود اینجا مدرسه‌ای بسازند: بڕیار وابوو لێرەدا قوتابخانەیەک دروست کەن›.
**قرار دادن:** نان؛ نیان؛ دانان؛ دانیان؛ نیایرە؛ بەلیاندن ‹گلدان را روی میز قرار داد: گولدانەکەی نایە سەر مێزەکەوە›.
**قرار گذاشتن:** بڕیار دان/ دانان؛ بەڵێن دان؛ پەیمان بەستن ‹قرار گذاشتیم تا سر ماه پولش را پس بدهیم: بڕیارمان دا تا سەری مانگ پارەکەی بدەینەوە›.
**قرار گرفتن:** ۱. دانران؛ دانریان؛ جێ گرتن؛ بنەگیر بوون؛ جێ بوونەوە؛ یاگەوە بیەی؛ دەبنەگرتن ‹گلدان روی میز قرار گرفت: گولدانەکە دانرایە سەر مێزەکەوە› ۲. هەدا دان؛ ئارام گرتن؛ داسرەفتن؛ داسرەوتن؛ داسرەوین؛ داکاسان؛ داکاسیان؛ داکاسین؛ ئەرەکاسیەی؛ کاسیایرە؛ داسەکیان؛ دامرکان؛ دامرکیان؛ دامرکین؛ داتەمریان؛ داکەسان؛ داکەسین؛ داسەکنان؛ هێور بوونەوە؛ داسەکنین؛ قریان؛ هێورین؛ هەدرین؛ هەدایش؛ ئۆقرەگرتن؛ وەقرەگێرتەی؛ کوپین؛ لە شوێنێک مانەوە.
**قرارداد** / qarārdād، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. بڕیار؛ پەیمان؛ گرێدانک؛ بڕیارنامە؛ پەیمان‌نامە؛ گرێبەست؛ هەڤبەست؛ بەڵێنامەیێ (پتر نووسراوە) کە بە پێی ئەوە دوو یان چەند لایەن مافێ بۆ یەکتر بە ڕەسمی دەناسن یا لە هەمبەر یەکترەوە کار و ئەرکێ وە ئەستۆ دەگرن.
◙ **قرارداد بستن:** بڕیارنامە نووسین؛ بەڵێن‌نامە نووسین؛ پەیمان‌نامە نووسین.
**قراردادی** / qarārdādî/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بڕیاری؛ پەیمانی؛ هەڤبەستی؛ بڕیارنامەیی؛ پەیمان‌نامەیی ‹استخدام قراردادی: دامەزرانی بڕیاری›.

**قرارگاه** / qarārgāh ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* بنکه؛ نگت؛ بنه؛ مەکۆ؛ مەکۆگە؛ قەرارگا؛ بنــەگا؛ شوێنی نیشتەجێ بــوون و دامــەزرانی هێزێکــی چەکداری.

**قرارومدار** / qarār-o-madār ، ـها/: [عربی]/*اسم.* *[گفتاری]* قەتع و بڕ؛ قەرارمەدار؛ قەوڵوبڕ؛ قەوڵ و قــەرار؛ کــار و ڕەوتی پێکهــاتن و بــڕیار دان بــۆ جێبەجێ کردنی کارێک.

**قراص** / qorās ، ـها/: [از فرانسوی]/*اسم.* قــوڕاس؛ یەکەی ژماردنی کاڵا، بریتی لە ١٢ دوجین (١٤٤ دانه): **قراصه**

**قراصه** / qorāse/: [از فرانسوی] ☜ **قراص**

**قراضــه** / qorāze ، ـهـا/: [عربی] *صفت.* کوخـار؛ ئاســنجاو؛ قــوڕازە؛ قــەڕازە؛ ســەقەت؛ کــۆن و لەکارکەوتە (بۆ کەرستە و ئامراز) ‹ماشین قراضــه: ماشینی کوخار›.

**قراقـــــوروت** / qarāqurût/: [ترکـــــی]/*اســـم.* قەرەقرووت؛ خــواردنێکی ڕەش و تــرش کــه لــه کولاندنی ئاوی ماستەوە بەرهەم دێ: **قرەقوروت**

**قراکل** / qarākol/: [؟]/*اسم.* قەرەکوڵ: ١. ـُـها/ جۆرێ مەڕی لەڕ و باریک کە دووەکەی سفت و خوریەکــەی زرو و لوولــه ٢. کــەوڵ و کولــکی بەرخی ئەو مەڕە.

**قران** / qerān/: [عربی]/*اسم.* ١. ـُـها/ *[گفتاری]* قــەران؛ قــڕان؛ ڕیــاڵ؛ یەکــەی پــارەی ئێــران ٢. *[نجوم]* بار و دۆخی جێگرتنی دوو یان چەند گەڕۆک لە کەلوویەکدا ٣. *[قدیمی]* دەورەی ٢٥، ٥٠ یــان ١٠٠ ســاڵــەی حکوومــەتی کــەس یــان زنجیرەیەک.

**قراول** / qarāvol ، ـها؛ ـان/: [ترکی]/*اسم.* چاتمــه؛ قەرەوڵ؛ پێشدار؛ پەهڤان؛ قــەلاویز؛ کێشــکچی؛ نیابان.

▣ **قراول رفتن:** نیشانەگرتن؛ قەرەوڵ‌گرتن.

**قراول گذاشتن:** نگابان دانان؛ قەرەوڵ دیــاری کردن ‹دم در خانه‌اش دو نفر قراول گذاشــته بودنــد: بەر دەرکی ماڵەکەی دووکەسیان نگابان دانابوو›.

**قراین** / qarāyen/: [عربی] جمعِ ☜ **قرینه**[1]: **قرائن**

**قرب** / qorb/: [عربی]/*اسم.* ١. *[نامتــداول]* نزیکــی؛ نێزیکی؛ چۆنیەتی لێک نزیک بــوونی دوو شــت. بەرانبەر: **دوری** ٢. *[نامتداول]* نێزیکی؛ نزیکــی بــه بۆنەی دۆستی یان خزمایەتیەوە ٣. *[مجازی]* پلــه و پێگە؛ شان و ڕێزی کۆمەڵایەتی.

**قربـــــان** / qorbān/: [عربـــی]/*اســـم.* ١. *[ادبـــی]* سەرگەرد؛ گۆڕی؛ گوهری؛ قوربــانی ٢. قوربــان؛ قــوروان؛ وشــەی ڕێــز لێنــان ‹بلــه قربــان: بەڵــێ قوربان›.

▣ **قربــان کســی/ چیــزی:** بــه قوربــانی کەســێ/ شتێک؛ شیاوی ڕێز و حورمەت لێنان؛ وە/ بــه ســەرگەردی کەســێ/ شــتێ ‹قربــان شــما: بــه قوربانتان›.

▣ **قربان کسی رفتن:** بە قوربانی کەسێک بــوون؛ لە دەوری (سەری) کەسـێک گــەڕان؛ وە/ بــه سەرگەردی کەسێ بوون؛ بە ساقەی کەسێک بوون؛ لە بەری کەسـێک مــردن ‹قربــان پســرم بروم که لنگــه نــدارد: بــه قوربــانی کورەکــەم بم وا هاوتای نیە›.

**قربان ـ صـدقه** / qorbānsadaqe/: [عربی]/*اسم.* *[تعــریض]* قوربــان و ســاقە؛ گفــت و لفــتی بــه میهرەبانی.

▣ **قربان‌ـصدقه رفتن:** لە دەور گەڕان؛ بە قوربان بوون؛ لە بەر مردن؛ وە/ بە سەرگەرد بوون.

**قربانگاه** / qorbāngāh ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کوشتارگە؛ کوشتنگە؛ جێگای قوربانی‌کردن.

**قربانی** / qorbānî ، ـهــا/: [عربی]/*اسم.* قوربــانی؛ قوروانی: ١. گیانەوەرێکی گۆشت حەڵاڵ کە بــه بۆنەیەکی تایبەتەوە سەری دەبڕن و گۆشتەکەی دەبەخشــنەوە ٢. ـُـان/ کەســێ کــه بــێ‌گونــا دەکوژرێت ‹قربانی جنگ: قوربانی شەڕ›.

▣ **قربــانی دادن:** قوربــانی دان؛ قــوروانی دان؛ گــۆڕی دان؛ لــە دەســت دانی کــەس یــان

کەسانێ وەکوو قوربانی ‹مردم برای کسب آزادی قربانی دادەاند: خەڵک لە پێناو ئازادیدا قوربانیان داوە›.

قربانی کردن: گۆری کردن؛ بە قوربان کردن؛ قوربانی/ قوروانی کردن: ۱. گیانەوەرێک (گۆشتحەلاڵ) بە بۆنەیەکەوە سەرژێ کردن و گۆشتەکەی لە نێو خەڵکدا بەش کردنەوە ۲. گیانەوەرێک بۆ ڕەزای خودا و بە ڕێوە بردنی ڕێورەسمێکی دینی سەر بڕین ۳. بوونە هۆی مردن یان تێدا چوونی ناڕەوا یان بێهۆی کەس یان شتێک. هەروەها: **قربانی شدن**

قربانی گرفتن: قوربانی گرتنەوە؛ کوشتنی ناڕەوا یان بێقانوونانەی مرۆڤ ‹زمین‌لرزه هزاران قربانی گرفت: بوومەلەرزە هەزاران قوربانی گرتەوە›.

**قربوس** / qarbûs ، ـها/: [عربی]/اسم. کەلوە؛ کەلبە؛ کەڵبەزین؛ بەرکۆ؛ پێشکۆ؛ قەڵپۆز؛ قەڵپووز؛ سەرقاچ؛ سەرقاچگ؛ گووزگریک؛ بەرزایی پێشەوەی زین: **قرپوس**

**قرپوس** / qarpûs/: [از عربی] ☜ **قربوس**

**قرتی** / qertî ، ـها/: صفت. جلف؛ خونک؛ قرت؛ قرتی؛ هەرزە؛ یارمباز؛ سووک و چرووک؛ هەرچی و پەرچی؛ دلسڤک؛ جیوەلەک؛ گرزە؛ ئاکار ناشیرین.

**قرتی‌بازی** / qertîbāzî ، ـها/: اسم. جلفی؛ هەرزەکاری و سووکی.

**قرچ‌ـقوروچ** / qerečqûrûč/: صوت. خرمەخرم؛ خرچەخرچ؛ قرتەقرت؛ قرچەقرچ؛ خرپەخرپ؛ دەنگی ورد بوونی شتێکی تورت (وەک دەنگی نانی ڕەق لە ژێر ددان یان بەفر لە ژێر پێدا).

**قرحه** / qorhe ، ـها/: [عربی]/اسم. /پزشکی/ زام؛ برین؛ زەخم، بەتایبەت زامێ کە دەمی بازە.

**قردمانا** / qordomānā/: [؟]/اسم. تەڕەتیزە تاڵە؛ گیایەکی دەشتەکی بە تۆوێکی ورد و زەرد و توونەوە، بۆ مەبەستی بژیشکی بە کار دێ.

**قرشت** / qarašat/: [عربی]/اسم. نێوی شەشەمین دەستەی پیتی ئەبجەد.

**قرشمال** / qerešmāl ، ـها/: [؟] صفت. کاوڵی؛ بێشەرم؛ بێحەیا؛ قیچمەز.

**قرص**[1] / qors ، ـها/: [عربی]/اسم. قورس: ۱. خرت؛ قورسە؛ ئەوەی بیچمی جەغزئاسایە ‹قرص خورشید: خرتی خۆر› ۲. حەب؛ حوب؛ هەب؛ گزموولەی دەرمان ‹قرص سرماخوردگی: حەبی پەتا› ۳. ئەستورکە؛ ماکێکی کیمیاوی یان خۆراکی وەک حەب ‹قرص نعناع: قورسی نەعنا›.

▣ **قرص خواب**: حەبی خەو؛ قورسوو وەرمی؛ قورسی خەوهێنەر.

**قرص سرماخوردگی**: حەبی پەتا؛ حەبی زوکام؛ قورسی چارەسەری هەلامەت.

**قرص**[2]: [؟] صفت. /گفتاری/ قورس؛ هێقم؛ قورس و قووڵ: ۱. قایم؛ پتەو؛ توڵا؛ گورخ. بەرانبەر: **شُل** ۲. قایم؛ جێگرتوو؛ بێلەرە و شەکە. بەرانبەر: **لق** ‹پایەی قرص؛ دهن قرص: بنەڕەتی پتەو؛ دەمی قایم›. هەروەها: **قرص بودن**

**قرص**[3]: قید. قورس: ۱. پتەو؛ گورخ ‹روی حرفش قرص ایستاده بود: لە سەر قسەی خۆی قورس وەستابوو› ۲. تون؛ سفت؛ مەحکەم ‹در را قرص بست: درگاکەی تون داوە› * بەرانبەر: **شُل**

**قرص‌و قایم** / qors-o-qāyem/: [؟/ عربی] قید. تون و تۆڵ؛ سفت و سۆڵ؛ قورس و قایم ‹دهنەی اسب را قرص و قایم نگهدار!: لەغاوی ئەسپەکە تون و تول بگرە!›.

**قرض** / qarz ، ـها؛ قُروض/: [عربی]/اسم. قەرز: ۱. بدەیی ‹قرضش را نمی‌دهد: قەرزەکەی ناداتەوە› ۲. وام ‹پول خانه را از بانک قرض گرفتیم: پارەی خانووەکەمان لە بانگ قەرز کرد›.

▣ **قرض دادن**: ۱. قەرز دان؛ قەرد دان؛ وام دان ‹پول داری به من قرض بدهی؟: پارەت لایە بە قەرز

بمده‌یتی؟› ۲. ئه‌مانه‌ت دان؛ ئه‌مانه‌تی شتێ به کەسێ دان ‹کتابت را چند روز به من قرض بده!: کتێبه‌کەم بۆ چەند ڕۆژ بە ئەمانەت بدەیە!›.

هەروەها: **قرض گرفتن**

**قرض داشتن:** قەرزدار بوون؛ قەرزار بوون؛ بدەکار بوون ‹هرچه قرض داشت همه را پرداخت: هەرچی قەرزدار بوو هەمووی داوە›.

**قرض کردن:** قەرزکردن؛ قەرزگرتن؛ وام‌گرتن.

**قرض‌الحسنه** / qarzolhasane/: [عربی]/*اسم.* قەرزی بێ‌سوو کە لە بەر ڕەزای خوا یان خێرخوازی، بە کەسێک دەدرێ.

**قرض‌وقوله** / qarz-o-qûle، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* *[گفتاری]* قەرز و قۆلە؛ قەرز و فەرز ‹اول باید قرض و قوله‌مان را بدهیم: پێشەکی پێویستە قەرز و قۆڵەمان بدەینەوە›.

**قرضه** / qarze، ـها/: [عربی]/*اسم.* وام؛ واو.

◘ **قرضه‌ی ملی:** وامێ کە دەوڵەت لە خەڵکی وەردەگرێ.

**قرطاس** / qertās/: [معرب از یونانی]/*اسم.* *[قدیمی]* کاغەز؛ قاغەز.

**قرطاس بازی** / qertāsbāzî/: [معرب/ فارسی]/*اسم.* *[قدیمی]* کاغەزبازی.

**قرع** / qar'، ـها/: [عربی]/*اسم.* قەرع؛ دەفرێکی شیشەیی بۆ پەشکاندن کە لە کوولەکەی مل‌گێڕ دەچێ.

**قرعه** / qor'e، ـها/: [عربی]/*اسم.* پشک؛ قورعە؛ لاتار؛ پسوولەی خۆ و بەخت.

◘ **قرعه افتادن:** پشک دەرهاتن؛ پشک کەوتن ‹قرعه به نام من اُفتاد: پشک بە نێوی منەوە دەرهات›.

**قرعه انداختن/ کشیدن:** پشک خستن؛ لاتار کیشان.

**قرعه‌کشی** / qor'ekešî، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ڤژانگ؛ ڤژاگ؛ لاتاری؛ کار و ڕەوتی هەڵبژاردنی بەختەکی ژمارە، ناو یان نیشانێ بۆ وەرگرتنی پشک یان بەڕێوە بردنی کارێک.

**قرق** / qoroq، ـها/: [ترکی]/*اسم.* پاوان؛ کۆدە؛ پاکژ؛ قۆرغ؛ قۆرخ؛ پەلەخ: ۱. *[قدیمی]* جێگایەک کە نامۆیان نەتوانن بچن ‹این منطقه قرق خان بود: ئەم ناوچەیە پاوانی خان بوو› ۲. *[قدیمی]* قەدەغە بوونی هات‌وچۆ ‹همینکه هوا تاریک می‌شد خیابان‌ها قُرق بود: هەر تاریکی دەکرد شەقامەکان قۆرخ بوون› ۳. قەدەغە؛ قەدەخە؛ کاری هەمانەدن؛ چۆڵ کردنی شوێنێک لە خەڵک ‹پوتین داشت می‌آمد مسیر را قُرق کرده بودند: پووتین دەهات شەقامەکانیان قورغ کردبوو›. هەروەها: **قرق بودن؛ قرق شدن؛ قرق کردن**

**قرقاتی** / qarqātî/: [ترکی] ☜ **قره‌قاتی**

**قرقاول** / qarqāvol، ـها؛ ـان/:/*اسم.* قەرقاوڵ؛ تەرەزوو؛ مرەکێفی؛ مریشکە کێوی؛ مریشکی کووڤی؛ چۆرە؛ چۆرپۆڕ؛ کەڵەشێری دارستان؛ باڵدارێکی سەر بە کاکۆڵی کلک‌درێژ و ڕەنگامەی لە مریشک گەورەترە کە لە لێڕەواردا دەژی و گۆشتی زۆر خۆشە.

**قرقبان** / qoroqbān، ـها؛ ـان/: [ترکی/ فارسی]/*اسم.* قۆرخچی؛ قەدەغەوان؛ کۆدەوان؛ پاکژوان: **قرقچی**

**قرقچی** / qoroqčî/: [ترکی] ☜ **قرقبان**

**قرقر** / qerqer/:/*اسم.* جیرەجیر؛ جیر و هۆڕ: ۱. دەنگی چەرخانی چەرخ ۲. جیرە؛ دەنگی لەولاوەی دەرگا.

**قرقرو** / qorqorû/ ☜ **غرغرو**

**قرقره** / qerqere، ـها/:/*اسم.* قرقرە؛ غەرغەرە؛ غەرغەرە؛ غەرەغەرە؛ قەنەک؛ کاژ؛ مەکارە؛ بەکرە؛ ماقرنە؛ گەرگەرە؛ کرکرە؛ خلۆکە؛ خلۆک؛ خوڵ‌خولۆکە؛ خلێنکە؛ خرخرە؛ خلووتە؛ خرنەک؛ گاج؛ تەشیلە؛ دارتوون؛ چرێک؛ چرک؛ چەرخەک؛ لوولک؛ لا؛ گلیلێکی دوو سەر پان، بۆ هەڵکردن و هەڵگرتنی ڕیسە (بەن، تەل و...).

**قرقی** / qerqî، ـها/: [ترکی]/*اسم.* واشە؛ باشە؛

باشووکه؛ باشوو؛ باشووک؛ بازۆڕی؛ تۆرتنه؛ تورمته؛ بازۆر؛ کەوزەنەک؛ پەلەوەرێکی ڕاوکەر، بە لەشێکی بچووک، لاقی درێژی زەرد، دووچکەی درێژ و باڵی کوڵ و خڕەوە: **باز گنجشک‌خوار؛ باشه**

**قرقیز** / qerqîz/: *اسم.* قرقیز: ١. هۆزی تورکی نیشتەجێی ئاسیای ناوەندی ٢. *ها؛ ـان/* هەرکام لە کەسانی ئەو هۆزە ٣. زمانی ئەو هۆزە کە لە زمانگەلی تورکیە.

**قرمز** [1] / qermez/: [سنسکریت] *اسم. [گفتاری]* سوور؛ سویر؛ سۆر؛ سوەر؛ خاز؛ قرمز.

**قرمز** [2]: *صفت. [گفتاری]* سوور؛ سویر؛ سۆر؛ قرمز؛ قورمز؛ بە ڕەنگی سوور.

**قرمزدانه** / qermezdāne، ـها/: [سنسکریت/ فارسی] *اسم.* ١. دووپایی؛ جۆرە مێرووییکە بە شێلەی دار دەژی و لە وشکەوەکردنی مێوینەکانیان چەشنێک ماکی سووری سروشتی بەرهەم دێ ٢. ئەو ماکە.

**قرمزی** / qermezî/: [سنسکریت] *اسم. [گفتاری]* قرمزی؛ سووری.

**قرمساق** / qoromsāq، ـها/: [ترکی] *اسم.* گەواد؛ گەوواد؛ گەوات؛ قورمساخ؛ دەویت؛ دویت؛ دەیووس؛ جاکەش؛ جاکێش؛ ژن‌بەمز؛ کوسکەش؛ کوسک؛ کۆدۆش؛ کەشیش؛ قەڵتە؛ قەڵتەبان؛ پیاوێ کە بۆ پووڵ، ژنە خزمی خۆی بۆ پیاوانی‌تر جۆر دەکا.

**قرمه** / qorme/: [ترکی] *اسم.* قەیلە؛ قاورمە؛ قەلی؛ قەڵیە؛ گۆشتی سوورەوەکراو وشکەوبووی لە هەمانەدا بۆ تفاقی زستان: **قورمه**

**قرمه‌سبزی** / qormesabzî/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* سەوزی‌قاورمە؛ قاورمەسەوزی؛ خۆرشتێکی لە پلە گۆشت، سەوزی جنراو و لوبیا.

**قرن** / qarn، ـها؛ قُرون/: [عربی] *اسم.* سەتە؛ سەدە؛ چەرخ؛ گەڕ؛ یەکەی ژماردنی کات بەرامبەر بە سەد ساڵ.

**قرنطینه** / qarantîne، ـها/: [معرب از فرانسوی] *اسم.* پاوانە؛ شوێنی ڕاگرتنی کەسانی بەرشک بە مەبەستی دڵنیا بوون لە پێوە نەبوونی ئاهۆ و پەتا و بەرگری لە تووش بوونی خەڵک.

◘ **قرنطینه کردن**: پاوانەکردن؛ پاوان‌کردن.

**قرنفل** / qaranfol، ـها/: [معرب از یونانی] *اسم.* مێخەک؛ مێخەکی؛ قەنەفل؛ قەنەفل؛ گوڵ مێخەک؛ گوڵە ئەسریل؛ گوڵە ئەسریلەک؛ گریشک؛ پنچکە گیایەکی ڕازێنەیی بە گوڵی بچووکی جەمکۆ و بۆنخۆشەوە کە لە سوور تا ئەرخەوانی هەیە.

**قرنی** / qaraney/: [ترکی/ فارسی] ☜ **قره‌نی**

**قرنیز** / qarnîz، ـها/: [؟] *اسم.* هێرە؛ قەرنیز: ١. لەندێکی بچووک بە سەر لێواری دیوار، درگا یان دەلاقەوە، پتر بۆ بەرگری لە داچۆڕانی باران ٢. ڕزنێکی باریک لە بەرد، کاشی یان مووزاییک بە پەڕانپەڕی لای خوارووی دیوارەوە بۆ جوانی و هەروەها بەرگری لە پیس بوون.

**قرنیه** / qarniye، ـها/: [عربی] *اسم.* کاژە؛ تۆژاڵێکی ڕوونی کۆم لە سەر بیبیلە و گلێنەی چاو.

**قروض** / qurûz, qorûz/: [عربی] جمعِ ☜ **قرض**

**قر و غربیله** / qer-o-qarbîle، ـها/: [فارسی/ از عربی] *اسم. [گفتاری]* ناز و نیمناز؛ قەلبیرە؛ خلنگ؛ عیشوە و ناز؛ قڕ و خەمزە.

**قر و غمزه** / qer-o-qamze، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم. [تعریض]* ناز و نیمناز؛ ناز و خەمزە؛ خەمزە و ناز؛ عیشوە و ناز؛ خلنگ؛ قەلبیرە؛ ئاکارێکی تایبەت بۆ خۆ نواندن و بزواندنی هەستی جینسی بینەر: **قر و غربیله؛ قر و قمیش**

**قر و فر** / qer-o-fer، ـها/: *اسم. [تعریض]* قڕ و فڕ؛ قیتەقیت؛ قڕ و نیمقڕ؛ کار و ڕەوتی خۆ جوان کردن بۆ سەرنج ڕاکێشانی دیتران.

**قر و قمیش** / qer-o-qamîš/: [فارسی/ ترکی] ☜ **قر و غمزه**

**قرون** / qurûn, qorûn/: [عربی] جمعِ ☜ **قرن**

**قره‌قاتی** [1] / qareqātî/: [ترکی] *صفت. [گفتاری]* تێکەڵ- پێکەڵ؛ تێکەڵوپێکەڵ؛ شێواو و شڵەژاو؛ شپرز؛ ئاڵۆز-پلۆز؛ تەڤ‌لهەڤ؛ تەڤلدم ‹همه چیز قره‌قاتی شده بود: هەموو شتێ تێکەڵ-پێکەڵ ببوو›.

**قره‌قاتی** [2]: *قید.* تێکەڵ— پێکەڵ؛ بە شێواوی و پەشێوی؛ بە شپرزی ‹همه را قره‌قاتی بریز روی هم: هەمووی تێکەڵ—پێکەڵ بکە بە سەر یەکدا›: **قرقاتی؛ قره‌قاطی**

**قره‌قاط** / qereqāt/: [ترکی] */اسم.* ترێ‌شین؛ ترێ‌شینکە؛ ترێۆکە؛ گرێ‌گەیلان؛ گیایەکی گەڵا دەندووکی، بە گوڵی سپی یان پەمەیی و بەری ڕەشەوە: **قرقاتی؛ قره‌قاطی**

**قره‌قاطی** / qereqātî/: [ترکی] ☜ **قره‌قاتی**

**قره‌قوروت** / qarequrût/: [ترکی] ☜ **قراقوروت**

**قره‌نی** / qaraney, qareney ، ـها/: [ترکی/ فارسی] */اسم.* قەرەنەی؛ نەیارەش؛ سازێکی بازەنی درێژ بە سەری دەندووکەیی، بنی گوشاد و ژمارەیەکی زۆر کون و کلیلەوە: **قرنی**

**قری** / qorā/: [عربی] جمعِ ☜ **قریه: قُرا**

**قری** / qerî/: *صفت.* بە قرەوە؛ بە ئاکاری سووک و جلفەوە.

**قری** / qorî/: */اسم.* قۆڕی؛ قوپاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی قۆڕ بوون.

**قریب** / qarîb/: [عربی] *صفت. [ادبی]* نزیک؛ نێزیک.

**قریب‌الوقوع** / -qarîbolvuqû', voqû'/: [عربی] *صفت.* نزیکەو ڕوودان؛ نێزیک بە ڕوودان.

**قریحه** / qarîhe ، ـها/: [عربی] */اسم.* زەوق؛ چێژە؛ لێهاتووی سروشتی بەتایبەت لە کارێکدا کە سەر بە داهێنانی هونەری و فیکری بێ ‹قریحه‌ی شعر: زەوقی شیعر›.

**قرین** / qarîn/: [عربی] *صفت. [ادبی]* هاوڕێ؛ هامڕا؛ هاواڵ؛ هاوکات؛ هاوچەرخ یان هاوڕێ لەگەڵ شتێک ‹تلاش او قرین موفقیت بود: تێکۆشانی هاوڕێ لەگەڵ سەرکەوتندا بوو›.

**قرینه** [1] / qarîne/: [عربی] */اسم.* ۱. ـها؛ قراین/ شوێن، ڕووداو، دیاردە یان واتایەک کە بە پێی ئەو شتێکی ترمان بۆ ڕوون بێتەوە و ئەو دووە وەکوو هاوڕێ وابن (وەک «بێشە» بۆ «شێر» کە شوێنە بۆ ئەوەی کە مەبەست شێری جەنگەڵە) ۲. لف؛ جووت؛ ئەوی کە لە باری ئەندازە، بیچم و چۆناوچۆنیەوە وەکوو وێنەی شتێکە لە نێو ئاوێنەدا (وەک دەستی ڕاست بۆ چەپ یان چەپ بۆ ڕاست) ۳. *[ریاضی]* بەرانبەر؛ بەرامبەر؛ ئەندازەیەک هاوتای ئەندازەیەکی تر بەڵام بە نیشانەی پێچەوانە (وەکوو ۲+ و ۲-).

**قرینه** [2]: *صفت.* لف؛ جووت؛ هاوتا؛ هاوقەد؛ هاودەق؛ خاوەن دەقاودەقی لەگەڵ یەکێکی تردا ‹دست راست قرینه‌ی دست چپ است: دەستی ڕاست لفی دەستی چەپە›.

**قریه** / qar(î)ye ، ـها؛ قُری/: [عربی] */اسم.* لادێ؛ دێهات؛ دەگا؛ لادەگا؛ شارەدێ؛ ئاوایی، بەتایبەت گەورە.

**قز** / qaz(z)/: [معرب از کردی] */اسم. [قدیمی]* قەز؛ کەژ؛ گرک؛ ئاوریشمی خاو.

**قزاق** / qazzāq/: [ترکی] */اسم.* قەزاق: ۱. ـها؛ ـان/ خەڵکی دانیشتووی ناوچەی قەزاقستان ۲. زمانی ئەو خەڵکە کە تێکەڵێ لە زمانی تورکی و موغولیە ۳. هێزێکی چەکداری تایبەتی لە ئێران لە نیوەی دووهەمی سەدەی پێشوودا.

**قزاقی** / qazzāqî/: [ترکی] */اسم.* آجر قزاقی ☜ **آجر**

**قزان** / qazān/: [ترکی] ☜ **قزغان**

**قزغان** / qazqān ، ـها/: [ترکی] */اسم.* قازان؛ قازانگ؛ قازانە؛ قەزان؛ بەرۆش؛ نەقل؛ قاولەمەی زۆر گەورەی مسین: **قزان**

**قزل‌آلا** / qezel'ālā, qezelālā ، ـها/: [ترکی] */اسم.* خاتوونەک؛ قزل‌ئالا؛ جۆرێ ماسی پووڵەکداری ئاوی شیرینە کە گەرا دەخا و گۆشتی بەتامە:

ماهی قزل‌آلا

**قـزل‌قـورت** / qozelqort/: [ترکـی] *دعــا*. قوزه‌ڵـقۆرت؛ دەرد؛ قـزە؛ زلفـنج؛ زڵـفنجاو؛ کنـدڕووس؛ ژەقنــه؛ ژەقنــەمووت؛ زەبرەبەنــد؛ سندان؛ وشـەیێ کـە بـۆ دەربـڕینی ڕق و قـین دەگوترێ.

**قزمیـت** / qozmît/: [ترکـی] *صـفت. [گفتـاری]* مــەراش؛ گــورگنــەخۆر؛ دزنەبــەر؛ دزگــین؛ بــێ‌کەڵــکە؛ هیچەکــە و پووچەکــە؛ بــێ‌دەوام؛ بێ‌بەرگە؛ دەردنەخۆر؛ بێ‌بایی؛ کار لێ‌نـەهاتووی بێ‌بایەخ ‹یک ساعتِ قزمیت آورده بود گرو بگذارد: ساعەتێکی مەراشی هێنابوو بینێتە گرێو›.

**قزن‌قفلی** / qazanqoflî ، ـها/: [ترکی/ عربی] *اسم.* بەلەزوانە؛ بەرەزوانە؛ ئـاوزوون؛ قرتێنـە؛ تەڕەقـە؛ قازانقوڵفی؛ قۆپچەی نێر و مێ؛ دەرزی بەرکۆژە؛ دوو قـولاپی بچـووک کـە دەچنـە نـاو یـەک و هەڵدەپێکرێن و وەکوو دوگمە بە کار دێت.

**قژ ـ قژ** / qejqej/ ☜ **غژ ـ غژ**

**قسـاوت** / qasāvat ، ـهـا/: [عربـی] *اسم. [ادبـی]* دڵڕەقی؛ بێ‌ڕوحمی؛ بێ‌بەزەییەتی.

⊡ قساوت داشتن: دڵڕەق بوون؛ بێ‌ڕوحم بوون.

قساوت کـردن: دڵڕەقـی کـردن؛ بـێ‌ڕوحمـی کردن.

**قسـر** / qeser/: [ترکـی] *قیـد. [گفتـاری]* بـێ‌وەی: ۱. بـێ بردنــەوە و دانـان لـە ڕەوتێکـی قومـاردا ۲. بێ‌گەزن و زیان لە ڕووداوێکی پڕ مەترسیدا.

⊡ قسر در رفتن: *[مجازی]* لە مەنجـەڵ گەڕانـەوە؛ کفـن دڕیــن؛ پەڕینــەوە؛ لــە بــەلا و تووشــی بێ‌وەی دەرچوون ‹این بار هم قسر در رفت: ئـەم جارەش لە مەنجەڵ گەڕایەوە›.

**قسط** / qest/: [معرب از یونانی] *اسم.* ۱. ـهـا؛ اقسـاط/ قسـت؛ قـنس؛ پـاژ؛ بەشـێک لــەوەی کــە لــە ماوەگەلی یەکساندا دەبێ بدرێ یان وەربگیردرێ ۲. ـها/ بەرانبــەری؛ بەرامبــەری، بەتایبــەت لــە گرتن یا دانی شتێکدا.

⊡ قسط بستن: پاژ/ قست بەستن؛ دیاری‌کـردنی هەندی دانەوە لە هەر جاردا.

قسط دادن: پاژ دانەوە؛ قست دانەوە؛ دانــەوەی قیمەت بە پاژ. هەروەها: **قسط گرفتن**

**قسط** / qost ، ـها/: [معرب از یونانی] *اسم.* هەڵـەزە؛ هەڵز؛ گیاگەڕی؛ زەنجەفێڵەشامی؛ بنەگیایـەکی گەرمەسـێرە بـە سـاقەتەی هەڵکشـاو و گوڵـی ئاڵـۆزەوە، دوو جـۆری تـاڵ و شـیرینی هەیـە، هەردوویان بۆ دەرمان دەبن.

**قسط‌بنـدی** / qestbandî ، ـهـا/: [معـرب/ فارسـی] *اسـم.* پاژبەنــدی؛ قســتبــەنی؛ کــار و ڕەوتی دیاری‌کردنی هەند و کـاتی دانـەوەی پاژەکـانی قەرزێک.

**قسطی**[1] / qestî/: [معرب] *صـفت.* قیستی؛ قسـتی؛ پــاژی؛ فــرۆش بــە شــێوەی ســەندنەوەی بەرەبەرەی پارەی شتەکە ‹فروش قسطی: فرۆشی قیستی›: **اقساطی**

**قسطی**[2]: *قید.* قیستی؛ قستی؛ پاژی؛ بە قیست؛ بە شێوەی وەرگـرتن یـا دانی بەرەــ بـەرەی پـارە ‹خانـە را قسـطی خریـده بـود: ماڵــەکەی قیسـتی کڕیبوو›: **اقساطی**

**قسم** / qasam ، ـها/: [عربی] *اسم.* سـوێند؛ سـۆند؛ سوێن؛ سوێنگ؛ قەسەم؛ قەستەم.

⊡ قسم ناحق: سوێندی بەناحەق؛ سـوێندی درۆ ‹قسم ناحق نخورا: سوێندی بەناحەق مەخۆ!›.

⊡ قسـم خـوردن: سـوێند خـواردن؛ قەســەم واردەی ‹قسم خورد کـە چیـزی نگفتـە: سـوێندی خوارد کە هیچی نەگوتووە›.

قسم دادن: سوێند دان؛ قەسەم دان/ دای ‹مرا قسم داد چیزی نگویم: سوێندی دام هیچ نەیژم›.

**قسم** / qesm ، ـها؛ اقسام/: [عربـی] *اسـم.* ۱. جـۆر؛ چەشن؛ تەرز ‹این قسم آدمها را تو نمـی‌شناسـی: تـۆ ئەم جورە کەسانە ناناسی› ۲. *[ادبی]* بــەش؛ بەشــە؛ بێش؛ پارچە ‹نان را سە قسم کرد و بە سە فرزنـدش داد: نانەکــەی کــردە ســێ بــەش و دایــە ســێ

منداله‌که‌ی›.

**قسمت** / qesmat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* به‌ش؛ به‌شه ۱. بێش؛ به‌هره یان به‌رکه‌وتووی هه‌ر که‌سێ ‹شاید قسمت این‌طور باشد که اینجا را بخری: ڕه‌نگه به‌ش وابێ ئێره بستێنی› ۲. چاره‌نووس؛ کابه‌شاک؛ قسمه‌ت؛ ڕووداوێ که چاره‌نووس ده‌ینووسێ ‹قسمت ما هم از زندگی این بود: به‌شی ئێمه‌ش له ژیان ئه‌مه بوو› ۳. به‌ش ــ به‌ش؛ پار؛ په‌ل؛ پشک؛ دابه‌ش؛ هیسا؛ پای؛ باره؛ پاره؛ فه‌لق؛ قه‌ت؛ قه‌تۆ؛ قارت؛ سه‌پک؛ گوێچ ‹قسمت کردن: به‌ش کردن›.

◘ **قسمت شدن:** ۱. دابه‌ش بوون؛ به‌ش ــ به‌ش بوون ‹۱۱ به ۵ قسمت نمی‌شود: ۱۱ به مـل ٥دا دابه‌ش نابێ› ۲. قسمه‌ت بوون؛ بوونه قسمه‌ت؛ نووسران؛ وه‌ک چاره‌نووس ده‌رهاتن ‹اگر قسمت شد می‌آییم: ئه‌گه‌ر قسمه‌ت بوو دێین›.

هه‌روه‌ها: **قسمت کردن**

**قسمنامه** / qasamnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* سوێندنامه؛ قه‌سه‌منامه.

**قسم و آیه** / qasam-o-āye ، ـها/: [عربی]/*اسم.* *[گفتاری]* سوێند و قورئان؛ سوێند و ئایه؛ قه‌سه‌م و قورئان ‹چقدر قسم و آیه خورد که اصلاً او را ندیده است: چه‌ندی سوێند و قورئان خوارد که هه‌ر نه‌یدیوه›.

**قسی** / qasî(y)/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* بێ ڕوحم؛ بێبه‌زه‌یی؛ بێبه‌زه؛ دڵ ڕه‌ق.

**قسی‌القلب** / qasîyyolqalb/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* بێبه‌زه‌یی؛ بێبه‌زه؛ دڵ ڕه‌ق؛ دڵ کوچکین؛ بێ ڕوحم؛ بێ ڕه‌حم؛ دڵبه‌رد.

**قشخون** / qošxûn/: [ترکی]/*اسم.* پالوو؛ پالۆ؛ پالدوو؛ پاردوو؛ قوشقن؛ قوشقنه؛ قشقنه؛ قشقونه؛ قوشقونه؛ قوێشه؛ که‌زووی بن کلکی باره‌به‌ر.

**قشر** / qešr ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ۱. توێکڵ؛ تێکوڵ؛ تۆکڵ؛ تێخوڵ؛ تیخوڵ؛ تۆخل؛ توێخڵ؛ تیخل؛ تویک؛ تێڤکل؛ تیڤل؛ تۆڤل؛ قه‌پێلک؛ شکولک؛ که‌واخه؛ کاژه؛ قاپۆڕ؛ قاپێلک؛ قه‌پیچک؛ په‌لک؛ قال؛ قالشت؛ قاشل ۲. *[نامتداول]* پێست؛ پۆس؛ پۆست؛ قه‌پێلک؛ قاپێلک؛ که‌واخه؛ سه‌ره‌کی‌ترین به‌شی له‌شی گیانه‌وه‌ر ۳. تۆژاڵ؛ توێژاڵ؛ توێژ؛ تۆ؛ لۆ؛ تۆلاشه؛ تۆژ؛ تۆخ؛ توێخ؛ تۆژک؛ مه‌ره‌ق ‹قشر نازک یخ: تۆژالی ناسکی یه‌خ› ٤. /اقشار/ *[جامعه‌شناسی]* توێژ؛ چین؛ تاقمێ له خه‌لک به تایبه‌تمه‌ندی کاری یان کۆمه‌لایه‌تی هاوبه‌شه‌وه ‹قشر دانشجو؛ قشر روشنفکر: چینی خوێندکار؛ توێژی ڕۆشنبیر›.

◘ **قشر مخ:** *[کالبدشناسی]* کورتێکس؛ کاژه‌ی مێشک؛ تۆژالێکی خۆڵه‌مێشی و چین له سه‌ر چین که مێکشی داپۆشیوه.

**قشری** / qešrî/: [عربی] *صفت.* ۱. /ـها؛ ـان؛ ـون/ سه‌رسه‌ری؛ ڕواڵه‌تی؛ لاگر و ڕه‌شه‌هۆگر له به‌ڕێوه بردنی ئایین و ڕێوڕه‌سمی ڕواڵه‌تی یان بیر و بۆچوونی بێبناغه و له گوتره، به‌بێ بیر کردنه‌وه له مه‌به‌ست و کاکڵه‌ی ئه‌و ئامۆژه‌یه ۲. ڕووکار؛ ده‌ره‌کی؛ سه‌ر به توێژ.

**قشعریره** / qoša'rîre/: [عربی]/*اسم.* ته‌زوو؛ ته‌ز؛ حاڵ و دۆخێ که له ترس و زیچی کوت‌وپڕدا به‌دی دێ و ده‌بێته هۆی گرژ و سێخ بوونی قژ، هه‌ڵپێکرانی ده‌م و ددان و شل و فل بوونه‌وه‌ی ماسوولکه‌ی له‌ش.

**قشقرق** / qešqereq ، ـها/: [ترکی]/*اسم.* *[گفتاری]* جاڕ و جه‌نجاڵ؛ هه‌را و هوریا؛ زه‌نازه‌نا؛ هاوار و فریا.

◘ **قشقرق راه انداختن:** کردنه زڵه؛ هه‌را و هوریا کردن ‹سر آن حرف قشقرقی راه انداخت که نگو: له سه‌ر ئه‌و قسه‌یه کردیه زڵه‌یێ نه‌بێته‌وه›.

**قشلاق** / qešlāq ، ـها/: [ترکی]/*اسم.* ۱. ئاران؛ گه‌رمیان؛ گه‌رمێن؛ گه‌رمانی؛ گه‌رمه‌سێر؛ گه‌رمه‌سیر؛ قشلاخ؛ قشلاق؛ زڤنگ؛ زستانه‌وار؛ زستانه‌هه‌وار؛ هه‌وارگه‌ی زستان ۲. جێ ژیانی

زستانه ٭ بەرانبەر: **ییلاق**

▣ قشلاق کردن: قشلاخ/ گرمێنکردن؛ گەرمیان چوون؛ زستانەهەوار چوون.

**قشلاقی** / qešlāqî/: [ترکی] *صفت.* گەرمێن؛ گەرمیان؛ گەرمیانی؛ گەرمەسێر؛ قشلاخی؛ قشلاقی؛ شیاوی ئاکنجی بوون لە زستاندا. بەرانبەر: **ییلاقی**

**قشمشم** / qašamšam ، ـها/: [از عربی] *صفت.* قەشەمشەم؛ قوشەمشەم؛ بە ئارایشت و جلوبەرگی تایبەت بۆ گرینگ نیشاندانی خۆ ‹آبجی قشمشم: باجی قەشەمشەم›.

**قشنگ** [1] / qašang/: *صفت. [گفتاری]* جوان؛ دەلال؛ شەپال؛ خوشیک؛ خشکوک؛ قەشەنگ؛ قەشەن؛ سپەهی؛ قازاخ؛ خرنگ؛ قەنج؛ فوودل؛ کەلان؛ زیوا ‹چشم قشنگ: چاوی جوان›.

**قشنگ** [2]: *قید. [گفتاری]* ڕێک؛ ڕاست؛ یەکڕاس؛ ڕاس ‹قشنگ آمد نشست کنار من: ڕێک هاتە لای منەوە دانیشت›.

**قشنگی** / qašangî/: *اسم.* باشی؛ جوانی؛ قەشەنگی؛ قەشەنی؛ کەیلانی؛ خرنگی؛ قەنجی ‹جای به آن قشنگی را گذاشتی آمدی اینجا؟!: شوێنی بەو باشیەت بەجێ هێشت و هاتیە ئێرە؟!›.

**قشو** / qašow, qašo: ، ـها/: [ترکی] *اسم.* پژنچە؛ قاشاو؛ قاشاق؛ قەشاو؛ قەشۆ؛ سەپکە؛ محەرس؛ محەس؛ ڕنەک؛ کەرەستەیەکی ددانەداری کانزایی وەک بڕۆس، چاروای پێ خاوێن دەکەنەوە.

▣ قشو زدن/ کردن/ کشیدن: پژنچە دان؛ سەپکە کردن؛ قاشاو کێشان.

**قشون** / qošûn, qušûn/: [ترکی] *اسم. [قدیمی]* قۆشەن؛ هۆردوو؛ ئوردوو؛ لەشکەر؛ لەشکر؛ سپا.

**قشونکشی** / qošûnkešî, qušûn- ، ـها/: [ترکی/ فارسی] *اسم. [گفتاری]* لەشکەرکێشی؛ لەشکرکێشی.

**قصائد** / qasā'ed/: [عربی] ☜ **قصاید**

**قصاب** [1] / qassāb ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* قەساو؛ قەساب: ۱. گۆشتفرۆش ۲. گورێن؛ سەربڕ؛ ئەسکەر؛ سەرژێکەر؛ کەسێ کە حێوان سەردەبڕێ.

**قصاب** [2]: *صفت. [کنایی]* قەساو؛ مرۆکوژ؛ پیاوکوژ؛ خەڵککوژ ‹علی شیمیایی قصاب کردستان: عەلی کیمیایی قەساوی کوردستان›.

**قصابخانه** / qassābxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کوشتارگا؛ قەساوخانە؛ قەسابخانە؛ شوێنێ کە مالاتی تێدا سەر دەبڕن.

**قصابی** / qassābî/: [عربی] *اسم.* قەسابی؛ قەساوی: ۱. کاری قەساب ‹مدتی قصابی می‌کرد: ماوەیەک قەسابی دەکرد› ۲. فرۆشگای گۆشت ‹در سردشت قصابی داشت: لە سەردشت قەسابی هەبوو› ۳. *[کنایی]* قەلاچۆ؛ کوشتوبڕ ‹در آن جریان عدەی زیادی را قصابی کردند: لەو کارەساتەدا قەلاچویان خستە خەڵکێکی زۆرەوە›.

**قصار** / qassār ، ـها/: [معرب از کردی] *اسم.* قەسار؛ گازر؛ جلشۆر؛ ئەوی جل دەشوا.

**قصاص** / qesās ، ـها/: [عربی] *اسم.* سزای هاوسەنگی تاوان (وەک ئەوەی کوژەر بکوژن و کوێرکەر کوێر کەن).

▣ قصاص کردن: تۆڵەسزا کردن؛ خۆشەوکردن؛ خۆشەوەکردن؛ تۆڵە و قەرەبووی خراپەکردن.

**قصاید** / qasāyed/: [عربی] جمعِ ☜ **قصیده: قصائد**

**قصبات** / qasabāt/: [عربی] جمعِ ☜ **قصبه**

**قصبه** / qasabe ، ـها؛ قصبات/: [عربی] *اسم.* شارۆچکە؛ شارەدێ؛ شارۆکە؛ کۆدێنێ لە گوند گەورەتر و لە شار چکۆلەتر.

**قصبةالریه** / qasabatorrîye/: [عربی] *اسم. [قدیمی]* کرکرۆک؛ زەنگەلوور؛ نای؛ لوولەی نێوان سی و گەروو.

**قصد** / qasd ، ـها/: [عربی] *اسم.* نیەت؛ نیاز؛ قەست؛ قەس؛ مخەت؛ مەبەست؛ قرم؛ مرخ؛

مراز؛ سەرنج و بیری ئاگەدارانە بۆ جێبەجێ کردنی کارێ.

◙ **از قصد:** *[گفتاری]* دەسانقەست؛ دەسانقەس؛ ئەنقەست؛ دەسقەس؛ لە قەستی.

◙ **قصد جان کسی را داشتن/ کردن:** کەوتنە تەمای گیانی کەسێکەوە؛ تەمای گیانی کەسێک کردن ‹دشمنانش قصد جانش را داشتند: نەیارانی کەوتبوونە تەمای گیانیەوە›.

**قصد داشتن:** بەنیاز بوون: ۱. ویستن؛ گەرەک بوون/ بیەی؛ هەرەک بوون ‹قصد داشت خانە بخرد: بەنیاز بوو خانوو بکڕێ› ۲. خوازیار بوون؛ بە قەستەوە کارێ کردن؛ بە مەبەست بوون ‹تو قصد داشتی دعوا راه بیندازی: تۆ بەنیاز بووی شەڕ هەڵخڕێنی›. هەروەها: **قصدی نداشتن**

**قصدمندی** / qasdmandî/: [عربی/ فارسی]/اسم. لەقەستی؛ دەسانقەست؛ دەسقەسی.

**قصر** / qasr ، ـها؛ قُصور/: [عربی]/اسم. کۆچک؛ کۆشک؛ قەسر؛ قەسرە؛ تەلار؛ سەرا؛ کاخ؛ ماڵی گەورە و شکۆدار.

◙ **قصر یخ:** کۆشکی سەهۆڵ؛ ماڵێ بە پێداویستگەلی شیاو بۆ شەمیتۆکی سەر سەهۆڵ.

**قصرنشین** / qasrnešîn ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. ۱. کۆشکنشین؛ تەلارنشین؛ نیشتەجێی کۆشک ۲. *[کنایی]* ساماندار؛ دەولەمەند؛ دارا؛ بوودە.

**قصص** / qesas/: [عربی] جمعِ ☜ **قِصّه**

**قصور** / qusûr, qosûr/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **قصر** ۲. کۆتایی؛ دریخی؛ درێغ؛ کاسوولی؛ قسوور؛ سستی یان کەمتەرخەمی لە ئەنجامدانی کارێکدا ‹برای این قصور عذر می‌خواهم: لە بەر ئەم کۆتاییە داوای لێبووردن دەکەم›.

◙ **قصور کردن:** هێڤشاندن؛ کۆتایی کردن؛ پاش خستن؛ ئاراستن. هەروەها: **قصور داشتن؛ قصور شدن**

**قصه** / qesse ، ـها؛ قِصَص/: [عربی]/اسم. داستان؛ داسان؛ داسانە؛ چیرۆک؛ چیرچیرۆک؛ نەقڵ و نەزیلە؛ حەکایەت؛ مەرسەلا: ۱. بەسەرهاتێکی هۆنراوە بۆ سەرگەرمی یان فێرکاری خەڵک ۲. ڕاز؛ ڕازە؛ ئەفسانە؛ دیرۆک؛ بەسەرهاتێکی خەیاڵی کە بەڕێوەبەرانی جڕ و جانەوەر، گیا و شتی خەیاڵی بن ۳. نووسراوەیێ کە سەربهوردەی وای تێدابێ ٤. *[مجازی]* قسە ‹این‌ها کە می‌گویی قصە است، من از تو جواب می‌خواهم: ئەمانەی باسی دەکەی چیرۆکە من وەڵامم دەوێ›.

**قصه‌پردازی** / qessepardāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. چیرۆک‌هۆنی؛ کاری داهێنان یان نووسینی داستان. هەروەها: **قصه‌پرداز**

**قصه‌خوان** / qessexān ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. چیرۆک‌بێژ؛ حەقایەت‌بێژ؛ ڕازبێژ. هەروەها: **قصه‌خوانی**

**قصه‌گو** / qessegû ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی]/اسم. چیرۆکڤان؛ حەکایەت‌خوێن؛ حەقایەت‌وان؛ مێژبێژ. هەروەها: **قصه‌گویی**

**قصه‌نویس** / qessenevîs ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. چیرۆک‌نووس؛ داستان‌نووس. هەروەها: **قصه‌نویسی**

**قصیده** / qasîde ، ـها؛ قصاید/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* قەسیدە؛ بیچمێ لە شعری عەرووزی بە زۆرتر لە ۲۰ بەیتی یەک قافیەوە.

**قصیده‌سرا** / qasîdesarā ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] صفت. قەسیدەبێژ؛ قەسیدەوان؛ قەسیدەهۆن.

**قضا** / qazā/: [عربی]/اسم. ۱. دادوەری؛ داوەری؛ دادپرسی؛ کاری داوەری ۲. چارەنووس؛ چارەنویس؛ ئەو شتەی کە بە ویستی خودا دەبێ ببێ ‹با قضا نمی‌شود جنگید: شەڕ لەگەڵ چارەنووس ناکرێ› ۳. قەزا؛ ڕەوتی فەوتان؛ فەوتیان؛ چوون ‹صبح دیر از خواب بلند شدم، نمازم

قضا شد: بەیانی دێر لە خەو هەستام، نوێژەکەم چووە قەزا›.

▣ قضای حاجت:*[مجازی]* دەس‌ئاو؛ دەس‌بەئاو؛ بۆ مەستەراو چوون.

از قضا: بە هەڵکەوت؛ بە شێوەیەکی ڕەچاو نەکراو ‹از قضا مرا دید: بە هەڵکەوت چاوی پێم کەوت›.

**قضائی** / qazā'î/: [عربی] ☜ **قضایی**

**قضائیه** / qazā'îyye/: [عربی] *صفت*. داوەری؛ دادوەری؛ دادپرسی.

**قضات** / qozāt/: [عربی] جمعِ ☜ **قاضی**

**قضاقورتکی** / qazāqûrtakî/: [عربی/ ترکی/ فارسی] *قید*. *[تعریض]* ناخەلاف؛ کت‌وپڕ؛ کوت‌وپڕ؛ نشک؛ بەختەکی؛ هاکۆیی؛ لەپڕ؛ نشکافک؛ نشکاڤی؛ نشگاف؛ نشکا؛ نشکاف؛ نشکێڤە؛ گز و گومەت.

**قضاوبلا** / qazā-vo-balā/: [عربی] *اسم*. *[گفتاری]* قەزا و بەلا؛ نەزە ؛ ڕووداوێکی ناخۆش کە لە دەستی کەسدا نیە.

**قضاوت** / qazāvat/: [عربی] *اسم*. داوەری: ١. دادوەری؛ دادپرسی؛ کاری قازی (دادوەر) ‹مقام قضاوت: پلەی دادوەری› ٢. *[ـها]* ڕەوتی بڕیاردان ‹خودت قضاوت کن: خۆت داوەری بکە›.

**قضاوقدر** / qazā-vo-qadar/: [عربی] *اسم*. قەزا و قەدەر؛ قەدەر؛ وەلەجاخ؛ قافل‌قەدا؛ چارەنووسی خوایی.

**قضایا** / qazāyā/: [عربی] جمعِ ☜ **قضیه**

**قضایی** / qazāyî/: [عربی] *صفت*. دادوەری؛ داوەری؛ سەر بە پیشە یان کاری داوەری: **قضائی**

**قضیه** / qazîyye ، ـها؛ قضایا/: [عربی] *اسم*. ١. ڕووداو؛ مەسەلە ‹دیروز قضیه‌ای پیش آمد: دوێنێ ڕووداوێک قەوما› ٢. *[ریاضی]* سەر بە یەکتری بوون و پێک گەیشتنەوەیەک لە نێوان دو یان چەند شتدا کە لە باری بیرکاریەوە سەلماوە.

**قطاب** / qottāb ، ـها/: [از عربی] *اسم*. قوتاب؛ شەکەرلەمە؛ لەبزینە؛ جۆری شیرینی کە لە ئاردی سپی، هێلکە، ڕۆن، گوڵاو، گوێز و خاکەقەن دروستی دەکەن.

**قطار** / qatār ، ـها/: [عربی] *اسم*. قەتار: ١. ترەن؛ شەمەندەفەر؛ کەرەستەیەکی گواستەنی بە شێوەی کۆمەڵە واگونی ڕیزکراو کە بە لکوموتیوێکەوە بەستراون و دەکێشرێن ٢. ڕیز؛ قەتارە؛ ڕزن؛ کاروان؛ سان؛ کۆمەڵە شتێکی لە شوێن یەک.

▣ قطار خیابانی: تراموا.

▣ قطار شدن: قەتار بوون؛ قەتارە بەستن؛ قەتار بەستن؛ ڕیز بەستن؛ ڕزن بەستن؛ ڕیز بوون.

قطار کردن: قەتارکردن؛ قەتارەکردن؛ ڕیز کردن؛ بەڕیزکردن.

**قطارگرفتگی** / qatārgereftegî/: [عربی/ فارسی] *اسم*. تووشی داگیراوی، سەرئێشە و ڕشانەوە بە هۆی لە نێو قەتاردا بوون.

**قطاع** / qetā' ، ـها/: [عربی] *اسم*. کووز؛ قاش؛ قاچ؛ پێڵە؛ کەوانە؛ بەشێک لە جەغز کە لە دوو لیزگ و کەوانەیەک پێک دێت.

**قطاع‌الطریق** / qattā'ottarîq ، ـها؛ قُطّاع‌الطّریق/: [عربی] *اسم*. *[قدیمی]* چەتە؛ جەردە؛ ڕێگر؛ ڕابڕ؛ ڕێبڕ؛ گۆران؛ چەتەوڵ.

**قطاع‌الطریق** / qottā'ottarîq/: [عربی] جمعِ ☜ **قُطّاع‌الطّریق**

**قطب** / qotb ، ـها/: [عربی] *اسم*. ١. جەمسەر؛ جەوسەر؛ چەسپەر؛ هێتم؛ پیتە؛ کورەک؛ پلسک؛ تەوەرا؛ بیجم؛ سەر و بنی شتێکی تۆپەڵ بەتایبەت گۆی زەوی ٢. بەرانبەر؛ هەر کام لە دوو شتی دژ بە یەک و پێوەندیدار بە یەکەوە ٣. هەر یەکە لە دوو سەری باتری یان دینام ٤. *[اقطاب]* پێشەوا؛ قوتب؛ پیر؛ سەرە.

▣ قطب آسیاب: تڤری؛ دڤری؛ بستوو؛ بست؛ بستە؛ بستک؛ بەندەقە؛ تەوەرە؛ ئاسنی نێوان

گەرووی بەرداش.

**قطب‌نما** / qotbnemā ، ـها/: [عربی/ فارسی]/سم. لانما؛ لانوێن؛ جەمسەرنما؛ جەمسەرنوێن؛ کەرەستەیەک بۆ ناسینەوەی چوار لایەنی باکوور، باشوور، ڕۆژهەڵات و ڕۆژاوا و نێوانیان بە پێی ناسینەوەی لای جەمسەر.

▣ **قطب‌نمای رادیویی:** جەمسەرنوێنی ڕادیۆیی؛ هەر یەکە لە کەرەستە و ئامێرگەلی ناسینەوەی لایەنی شەپۆلی ڕادیۆیی.

**قطبی** / qotbî/: [عربی] صفت. جەمسەری؛ بیجمی؛ پێوەندیدار یان سەر بە جەمسەر.

**قطبین** / qotbeyn/: [عربی]/سم. دوو جەمسەر؛ دوو جەوسەر.

**قطر** / qotr ، ـها/: [عربی]/سم. کۆتەر؛ تیرە: ۱. ڕیس؛ گێپەڕ؛ کۆتەرە؛ کۆپەڕە؛ ڕەوق؛ بارست؛ ڕادەی ئەستوورایی دەوری هەر شتێک ۲. /اقطاب/ لەتە هێڵێکی ڕێک کە لە ناوەندی تەشکێکی کەوانەییەوە تێدەپەڕێ و دوو خاڵ لە کەوانەکە دووسەریەتی.

▣ **قطر اَطول:** کۆتەری درێژ؛ ڕیسە درێژ؛ درێژترین ڕیس.

**قطر اَقصَر:** کۆتەری کورت؛ ڕیسە کورت؛ کورت‌ترین ڕیس.

**قطر خارجی:** کۆتەری دەرەکی؛ مەودای نێوان دوو خاڵی بەرامبەر بە یەک لە سەر توێکڵی دەرەکی جەغزێکدا. هەروەها: **قطر داخلی**

**قطرات** / qatarāt/: [عربی] جمعِ ☜ **قطره**

**قطران** / qatrān/: [عربی]/سم. [شیمی] قەتران؛ تراوێکی نیوە سفت و لینجی قاوەیی تا ڕەش، بریتی لە تێکەڵاوی چەند ماکی هیدرۆکەربونی چەور کە لە ئەنجامی دڵۆپاندنی بەردەخەڵووز و چێو بەرهەم دێ و بە کوڵاندنی، گەلێ ماکی بەکەڵک وەک نەوت جوێ دەبێتەوە.

**قطره** / qatre ، ـها؛ قَطَرات/: [عربی]/سم. تنۆک؛ تنۆکە؛ توونەک؛ تکە؛ چکە؛ چیک؛ چپ؛ وت؛ لۆک؛ دڵۆپە؛ دروپ؛ دڵۆپ؛ درۆپ؛ درۆپە؛ چۆڕ؛ چوڵ؛ پەشک؛ پرووشنگ؛ زەنگوڵ؛ تیف؛ قەترە: ۱. ئەوندە لە تراوێ کە بە شێوەی خڕ و گرۆڤەر دەڕژێ ‹قطرەی آب: تنۆکی ئاو› ۲. [مجازی] کەمترین هەندی تراوێ ‹یک قطره آب پیدا نمی‌شود: تنۆکێک ئاو دەس ناکەوێ› ۳. دەرمانێ کە بە تکاندن بە کار دەبرێ ‹قطرەی چشم: قەترەی چاو›.

**قطره‌چکان** / qatrečekān ، ـها/: [عربی/ فارسی]/سم. ئابدۆزەک؛ ئاودوزەک؛ ئاودزەک؛ قەتارە؛ قەترەکێش؛ دڵۆپ‌تکێن؛ قەترەچەقان؛ لوولە شووشەی دەم تەنگ بە کڵاوی پلاستیکەوە بۆ تکاندنی دەرمان.

**قطری** [1] / qotrî/: [عربی] صفت. کۆتەری؛ کۆپەرەیی؛ کۆتەرەیی؛ تیرەیی؛ سەر بە کۆتەرە ‹برش قطری: بڕینی کۆتەری›.

**قطری** [2]: قید. کوتەری؛ کۆتەرەیی؛ کۆپەڕەیی؛ بە باری کۆتەرەدا ‹تخته را قطری برید: تەختەکەی کۆتەری بڕی›.

**قطع** / qat'/: [عربی]/سم. ۱. قەرت؛ قەت؛ قەد؛ بڕ؛ دابڕ؛ لەت؛ کەرت؛ گن؛ کار و ڕەوتی بڕین ‹قطع عضو: بڕینی ئەندام› ۲. دڵنیایی تەواو ‹با قطع و یقین: بێ‌شەک و بە دڵنیایی تەواوەوە› ۳. /ـها/ ئەندازە؛ ڕادەی (پانی و درێژی) شتی پەڕەیی ‹قطع کتاب: ئەندازەی کتێب›.

▣ **قطع امید:** دۆخی ناهمێ بوون؛ ناهومێد بوون؛ دڵ بڕین؛ هیوا لێ‌بڕین.

**قطع بغلی** ئەندازەیەک لە کاری چاپەمەنیدا، بۆ کتێب یان دەفتەر کە لە دەوروبەری ۸×۱۲ سانتیمیتردایە.

**قطع بیاضی:** بیجمێک بۆ پەڕاو و کتێب کە بە باری درێژیدا بکرێتەوە.

**قطع تماس:** نەمانی پێوەندی؛ پێوەندی بڕان/ پسان/ پچڕان.

**قطع جیب پالتویی:** ئەندازەیەک لە کاری

چاپەمەنیدا، بۆ کتێب یان دەفتەر کە لە دەوروبەری ۱۱،۵×۲۱ سانتیمیتردایە.

**قطع جیبی** ئەندازەیەک لە کاری چاپەمەنیدا، بۆ کتێب یان دەفتەر کە لە دەوروبەری ۱۱،۵×۱٦ سانتیمیتردایە.

**قطع خشتی:** ئەندازەیەک لە کاری چاپەمەنیدا، بۆ کتێب یان دەفتەر کە لە دەوروبەری ۱٦،۵×۲۱ سانتیمتردایە.

**قطع رابطه:** دۆخی لێک بران؛ لە یەک بڕیان؛ نەمان و پچڕانی پێوەندی.

**قطع رحلی** ئەندازەیەک لە کاری چاپەمەنیدا، بۆ کتێب یان دەفتەر کە لە دەوروبەری ۲۱×۲۸ سانتیمیتردایە.

**قطع رحلی بزرگ:** ئەندازەیەک لە کاری چاپەمەنیدا، بۆ کتێب یان دەفتەر کە لە دەوروبەری ۲۳×۳۳ سانتیمیتردایە.

**قطع رقعی:** ئەندازەیەک لە کاری چاپەمەنیدا، بۆ کتێب یان دەفتەر کە لە دەوروبەری ۱٤×۲۱ سانتیمیتردایە.

**قطع سلطانی** ئەندازەیەک لە کاری چاپەمەنیدا، بۆ کتێب یان دەفتەر کە لە دەوروبەری ٤۳×٥۸ سانتیمیتردایە

**قطع عضو:** بڕینی ئەندام؛ قەڵەمی ئەندام.

**قطع وزیری:** ئەندازەیەک لە کاری چاپەمەنیدا، بۆ کتێب یان دەفتەر کە لە دەوروبەری ۱٦،۵×۲۳ سانتیمیتردایە.

◘ **قطع شدن:** ۱. قرتان؛ قرتیانش؛ قەتان؛ قەرت بوون؛ گەزخان؛ پسان؛ پەڕین؛ پڕەی؛ پڕای؛ کەتان؛ قەڵەم بوون ‹دو انگشتش قطع شد: دوو قامکی قرتا› ۲. بران؛ دابڕیان؛ برانەوە؛ بڕیایەوە؛ درێژەدار نەبوون ‹صدایش قطع شد: دەنگی برا›.

**قطع کردن:** بڕین؛ بڕینەوە؛ قەتاندن؛ بڕتەی؛ بڕیەی: ۱. قرتاندن؛ قرتانن؛ قرتنای؛ قرتنەی؛ پچڕین؛ پچڕاندن؛ بچڕین؛ بچڕاندن؛ پچەڕین؛ پڕچنەی؛ پڕچنای؛ کەتاندن؛ پساندن؛ پاچین؛ گەزخاندن؛ پەڕاندن؛ پڕنەی؛ پڕنای؛ چڕتن؛ فەکاندن؛ قوتانن؛ قەرت/ قرت کردن؛ لێک جیا کردنەوە ‹شاخه‌های اضافی را قطع کرد: لقە زیادەکانی قرتاند› ۲. چیدی درێژە نەدان ‹حرفش را قطع کرد: قسەکەی بڕی›.

**قطعاً** / qat'an/: [عربی] قید. خاترجەم؛ ژ بن؛ بە تەواوی؛ حەتم؛ وە حەتم؛ بێ‌ئەملا و ئەولا ‹فردا قطعا می‌روم: خاترجەم بەیانی دەچم›.

**قطعات** / qata'āt/: [عربی] جمعِ ☜ **قَطعه**

**قطعنامه** / qat'nāme، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. بڕیارنامە؛ بەڵگەیەک کە هێندێک داخوازی تێدایە و لە کۆبوونەوەیەکدا پەسەندکراوە.

**قطعه** / qat'e, qet'e، ـها؛ قَطَعات/: [عربی] /اسم. ۱. کەت؛ پارچە؛ پاژ؛ بژ؛ گەزخ؛ پرت؛ گن؛ کوت؛ لەتک؛ لەت؛ لەتە؛ لت؛ لەهـ ؛ تیکە؛ قەڵ؛ بڕ؛ دابڕ؛ بانە؛ پال؛ گن؛ لەک؛ پەنچک؛ بەشی جیاکراوە یان جیاواز لە شتێ ‹قطعه چوب: پارچە چێو› ۲. /ادبی/ نەوشەک؛ هەڤۆک؛ وەند؛ قەتعە؛ شیعرێ بە ۲ تا ۲۰ بەیت لەسەر یەک کێش و پاشەڵ، کە بە پێچەوانەی قەسیدە و غەزەڵ، باڵی یەکەم و دووهەمی بەیتی سەرەتا هاو قافیە نین ۳. یەکەی بڕێ شتی وەک: زێڕ و زیو، بەلگە، زەوی و زار، ژێرراخەر، پەلەوەر و ئاوژی و ئەسکەناس ٤. تیکە؛ هەر بەشێکی کەرەسە یان ئامێری دەزگایێ ‹یک قطعه‌ی ماشین شکسته بود: تیکەیەکی ماشینەکە شکابوو› ٥. لەتە؛ پاژ؛ بەشێک لە دەزگایێ کە بە جارێک دروست کراوە یان بە قالبێک ڕێژراوە ‹کارگاه قطعه‌سازی: کارگای لەتەسازی› ٥. /موسیقی/ قەتعە؛ بەشێکی کورتی مووسیقایی بە بێ ناسنامە.

**قطعه الفرس** / qat'atolfaras/: [عربی] /اسم. /نجوم/ کەلوویەکی بچووک و لێڵ لە ئاسمانی نیوەگۆی باکووریدا.

**قطعه‌بندی** / qat'ebandî, qet'e-، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. دابەشکاری؛ کار و ڕەوتی دابەش

کردنی زەوی و زار بە پارچەگەلی دیاریکراو.

**قطعه‌سازی** / qat'esāzî, qet'e- /: [عربی/ فارسی] /اسم. لەتەسازی: ۱. /ـها/ کار یان فەنی چێ‌کردنی پاژگەلی پیشەسازی (وەک ماشین، چەرخی درووماان و...) ۲. کارگەیێ بۆ دروست‌کردنی پاژگەلی پیشەسازی.

**قطعه ـ قطعه** / qat'eqat'e /: [عربی] صفت. پاژـپاژ؛ پارچە ـ پارچە؛ کوت ـ کوت؛ لەت ـ لەت؛ کەرت‌ـکەرت؛ دابڕـدابڕ؛ گن‌ـگن؛ شەقەبەقە.

▣ **قطعه ـ قطعه کردن**: کوت ـ کوت کردن؛ لەت ـ لەت‌کردن؛ پارچە ـ پارچە کردن؛ گەزخاندن.

**قطعی** / qat'î /: [عربی] صفت. ڤەبڕی: ۱. مسۆگەر؛ مسەوگەر؛ بێ سێ‌ودوو ۲. *[گفتاری]* براو؛ بڕیاو؛ بڕیاگ؛ بڕیا؛ لەت‌بوو.

**قطعیت** / qat'îyyat /: [عربی] /اسم. مسۆگەری؛ مسەوگەری ‹خیلی با قطعیت حرف می‌زد: زۆر بە مسۆگەریەوە قسەی دەکرد›.

▣ **قطعیت یافتن**: مسۆگەر/ مسەوگەر بوون ‹بالاخره آن معامله قطعیت یافت: ئاخری ئەو مامەڵەیە مسۆگەر بوو›.

**قطور** / qatûr /: [عربی] صفت. ئەستوور؛ کولـوفت؛ کلفت؛ قایم ‹چوب قطور: چێوی ئەستوور›.

**قطوع** / qotû', qutû' /: [عربی] جمعِ ☜ **قطع**

**قطیفه** / qatîfe ، ـها /: [عربی] /اسم. *[قدیمی]* خاولی؛ مەرحەمە؛ حەولە؛ پشتەماڵ؛ دەرجاو؛ قەیفە؛ قەدیفە؛ قەدیفک: **قدیفه**

**قعر** / qa'r /: [عربی] /اسم. بن؛ بنە؛ بندین؛ قووڵایی؛ تەخت؛ بێخ؛ بنک؛ نق ‹قعر چاه: بنی چاوانە›.

**قفا** / qafā /: [عربی] /اسم. *[ادبی]* قۆڕک؛ پشتەمل؛ ئەستۆگوردە؛ ئەستۆکوردە؛ پاتک: ۱. پشت مل؛ بۆق؛ بۆقمل؛ پشت‌گەردن؛ گێزەرە؛ پشت‌ئەستۆ ۲. پشتەسەر؛ پشت‌سەر؛ دوا؛ پشتی سەر ‹کاروان از قفایش می‌آمد: کاروان لە پشتەسەریەوە دەهات›.

**قفائی** / qafā'î /: [؟] ☜ **قفایی**

**قفایی**[1] / qafāyî /: [؟] /اسم. ڕەنگی بەنەوشی کاڵ؛ ڕەنگی وەک گوڵە چەقچەقە: **قفائی**

**قفایی**[2]: بە ڕەنگی بەنەوشی کاڵ: **قفائی**

**قفس** / qafas ، ـها /: [معرب از یونانی] /اسم. قەفەس؛ قەفەز؛ قەفەسە؛ قەفەزە: ۱. لیسک؛ ڕکە؛ ڕک؛ ڕککە؛ بەرکم؛ بێرکم؛ هەودەک؛ هەود؛ توولە؛ جابەی لە توول یان تەل دروست کراو بۆ ڕاگرتن و گواستنەوەی گیانەوەران ۲. *[کنایی]* قەورەقوولە؛ شوێنی تەنگەبەر و ناخۆش.

**قفسه** / qafase ، ـها /: [معرب/ فارسی] /اسم. قەفەزە؛ قەفەسە؛ زکەو؛ ڕکەهـ ؛ بێر؛ ڕەکک؛ کۆتلە؛ چوارچێوەی لە دار، کانزا یان پلاستیک بە پەڕەگەلی ئاسۆیی نێوانداروەوە بۆ هەڵچنینی ڕێک‌وپێکی شت‌ومەک لە سەری.

▣ **قفسه‌ی سینه**: قەفسینگ؛ ڕکەڵ؛ ڕکەل؛ قەفەزە؛ قەبەزە؛ دەفەی سینگ؛ ئێسکی تەختی سنگ و پشت.

**قفسه‌بندی** / qafasebandî ، ـها /: [معرب/ فارسی] /اسم. قەفەسەبەنی؛ قەفەزەبەنی؛ کار و ڕەوتی پێکەوە نان و هەڵچنینی قەفەزە لە شوێنێک.

**قفقازی** / qafqāzî /: /اسم. قەفقازی: ۱. ڕەگەزی سپی پێستی نائاریایی لە باکووری ڕووباری ئاراز و ڕۆژاوای باکووری دەریای خەزەرەوە تا لێوارەکانی دەریای ڕەش ۲. /ـها؛ ـان/ هەر کام لە خەڵکی ئەو وڵاتە (بریتی لە گورجی، ئەبخاز، چچێن و لەزگی).

**قفل** / qofl ، ـها /: [عربی] /اسم. قفڵ؛ قوفڵ؛ قولف؛ گۆڵە؛ کۆد؛ کۆج؛ ڕیچ؛ چفت؛ چیلان؛ کلۆن (دارینە)؛ کلێلە؛ کیلۆن؛ کولۆم؛ کێلوون؛ کەسەک؛ کلیت؛ کلیل؛ ئامرازێک بۆ داخستنی شتێک و بەرگری لە دەست پێگەیشتنی دیتران.

▣ **قفل رمزی**: قوفڵی ڕەمزدار؛ قوفڵێ کە کردنەوەی لە سەر بنەمای ڕەمزێکی دیاریکراو بێت.

قفل سویچی: قوفڵی سوویچی؛ قوفڵێ کە ساچمە و فەنەری تێدایە و تەنیا بە کلیلی خۆی دەکرێتەوە و دەبەسرێ.

قفل کارتی: قوفڵی کارتی؛ قوفڵێ کە بە دانانی سیمکارت لە نێویدا دەکرێتەوە.

◘ قفل بودن: قوفڵ بوون؛ کلیل/ کلیل بوون؛ بەسراو/ بەسیاگ بوون.

قفل شدن: قوفڵ بوون: ۱. داخران؛ داخریان؛ ژەنیان؛ بەسیان؛ ژنیەی ۲. کلێلە بوون؛ گۆلە بوون؛ کۆد بوون؛ سفت بە یەکەوە هەڵپێکیان یان پێکەوە لکان.

قفل کردن: قولف کردن؛ گالەدان؛ داخستن؛ ژەندن؛ ژەی؛ ژای؛ ژەنتەی؛ قفل دان؛ کلیل دان؛ کولۆمکردن (بۆ درگا).

**قفلی** / qoflî/: [عربی] *صفت.* قولفی؛ قوفلی؛ قوفڵکردنی ‹سنجاق قفلی: سنجاخ قولفی›.

**قفیز** / qafîz/: [معرب از کردی] *اسم. [قدیمی]* کەویژ؛ قەفیژ؛ کەڤیز؛ کەڤیژ؛ کێوژ؛ کەویج: ۱. یەکەی کێشانە و پێوان: **کویز** *[ادبی]* ۲. پێوانەیێ بۆ دەخڵ و دان ‹بیست و اند هزار قفیز گندم انبار شده است: بیست و چەند هەزار کەویژ گەنم هەمار کراوە›.

**ققسی** / qoqosî ، ـها/: *اسم.* کەڵەبابە؛ قرک؛ گوێزەی ئەستۆ؛ ئێسکی ڕەقی قورقوڕاچکەی مرۆ.

**ققنس** / qoqnos/: [معرب از یونانی] *اسم.* قەقنەز؛ قەقنەس؛ گەنەس؛ قاقنەس: ۱. باڵدارێکی خەیاڵیە کە دەڵێن دوای هەزار ساڵ ئاگر دەگرێ و دەسووتێ و لە خۆڵەمێشەکەی قەقنەزێکیتر سەر هەڵدەدا ۲. *[نجوم]* سیمرخ؛ کەلوویەکی ئاسمانی ✱ **ققنوس**

**ققنوس** / qoqnûs/: [معرب از یونانی] ☜ **قُقنُس**

**قل** / qel/: *اسم. [گفتاری]* تل؛ خل؛ پل؛ گل؛ تلار؛ خلار؛ گلار؛ تلۆر؛ خلۆر؛ گلۆر؛ تلێر؛ خلێر؛ خلیر؛ بانگرۆز؛ ئۆتوز؛ خرتەگل؛ خەول؛ کار و ڕەوتی تلۆر بوونەوە.

◘ **قل خوردن**: تل بوونەوە؛ تلێر بوونەوە؛ تلار بوونەوە؛ خلێرەو بون؛ تلەو بوون؛ تلەوە بیەی؛ خلۆر بوونەوە؛ خل بوونەوە؛ گلان؛ تل واردەی؛ تلانەوە؛ تلیایوە؛ تلێران؛ خلان؛ خلێران؛ گەوزین؛ خلیان؛ خەولان ‹قِل خورد و افتاد توی آب: تل بووە و کەوتە نێو ئاوەکە›.

**قل دادن**: تلارکردنەوە؛ تلێرەوکردن؛ خلێرەوکردن؛ تل دان؛ تلاندن؛ تلانن؛ تلنەی؛ گلانن؛ پلانن؛ پلاننەوە؛ تل دای؛ خەولاندن ‹توپ را قِل داد به طرف من: تۆپەکەی بەرەو من تلار کردەوە›.

**قُل** / qol/: *صوت. [گفتاری]* قولت؛ قولتە؛ قولتەقولت؛ کول؛ قلپ؛ قولەقول؛ کولەکول؛ قلتەقلت؛ قولپە؛ قولپ؛ قلف؛ قلپە؛ بلقەبلق؛ قیچـقیچ؛ قرژـقرژ؛ قولتوکول؛ دەنگی کولانی ئاو یان شتێکی تراو: **قُل ـ قُل**

◘ **قل زدن**: قولت دان؛ کولیان؛ کول دان؛ قولێ دای/ شانای؛ کولان؛ کەلان؛ کولین؛ کەلین؛ کەلیان؛ گریەی؛ جۆشین؛ قلتیان؛ قولتان ‹سماور داشت قُل می‌زد: سەماوەرەکە خەریک بوو قولتی دەدا›.

**قلاب** / qollāb ، ـها/: [از عربی] *اسم.* نهک؛ نەق؛ قولاو؛ قولاپ؛ قولاب؛ قولاپە؛ کولاب: ۱. کەرەسەیێ سەرچەمێنراو بۆ گرتن، کێشان یان هەڵاوەسین *الف)* ماسی گرتن *ب)* درومان و چنین (کاموا، تەل و...) *ج)* چەنگەک؛ چەنگاڵ؛ چنگاڵ؛ چەنگڵ: **نشپیل** ۲. نیشانەی کرۆشە: [ ] ۳. *[جانورشناسی]* ئەندامێ وەک گیرە لە ڕەقپێستاندا کە بۆ هێرش بردن یان بەرگریکردن لە هێرشبەر بە کار دێت: **گازانبر ـ ۲**

◙ **قلاب لباس**: چێوڕەختی؛ چێولیباسی.

◘ **قلاب کردن**: ئالقە/ ئەڵقەکردن؛ هەڵبگاردن؛ هەڵپێکان؛ هۆرویارەی ‹دستش را دور گردنم

قلاب کرد: دەستی بە دەوری ملمدا ئاڵقە کرد›.

**قلاب گرفتن:** پەنجە/ دەس هەڵپێکان؛ پەنجە ویارەی؛ قامکانی دوو دەست لە نێو یەک کردن و لەپی دەستان بەرەوسەرگرتن بۆ هەڵگرتنی شتێکی قورس ‹قلاب گرفت رفتم بالای دیوار: پەنجەی هەڵپێکا چوومە سەر دیوارەکە›.

**قلابدوزی** / qollābdûzî ، ـها/: [از عربی/ فارسی] /اسم/. قولاپ‌دووری؛ جۆرێ گوڵ‌دووری بە بەنی هەوریشمی.

**قلابسنگ** / qollābsang ، ـها/: [از عربی/ فارسی] ☜ **فلاخن**

**قلابی** / qollābî ، ـها/: [از عربی] صفت. ۱. هەڵبەستە؛ ڕەشۆکی؛ سهر؛ سهرک؛ قولابی؛ خرش ‹سند قلابی: بەڵگەی هەڵبەستە› ۲. درۆیینە ‹شرکت قلابی: شەریکەی درۆیینە›.

**قلاده** / qallāde ، ـها/: [عربی] /اسم/. ۱. کالان؛ کەلەن؛ کالانە؛ گلادە؛ قەلادە؛ قەلاتە؛ قەلادە؛ قلاتە؛ قلادە؛ قەڵەنگ؛ دۆدک؛ دۆد؛ شەباک؛ شەبەک؛ ملقان؛ ملقانک؛ ڕست؛ ڕستک؛ خەلیتە؛ خەلتە؛ خەڵتە؛ سیتە؛ مەرس؛ مەرەس؛ قلێتە؛ قەڵێتە؛ ستۆبەند؛ گەرگوونگ؛ تەوق؛ تۆقی مل؛ ئاڵقە و زەنجیرێ کە دەیکەنە ملی سەگ و جانەوەری درندەی‌تر ۲. یەکەی ژماردنی ئەم جۆرە جانەوەرانە.

**قلاش** / qallāš/: صفت. فێڵباز؛ فریوباز؛ کەڵەکباز؛ ساختەچی؛ قولتەش.

**قلاع** / qelā'/: [عربی] جمعِ ☜ **قلعه**

**قلاویز** / qalāvîz ، ـها/: [؟] /اسم/. قەلاویز؛ هەڵکنراوی لاوەلای باری ناوەوەی لوولە، سەرپێچ و ...

▣ **قلاویز کردن:** قەلاویزکردن؛ چێ‌کرنی هێڵی لاوەلا لە باری ناوەوەی لوولە و سەرپێچ و...دا.

**قلب**[1] / qalb/: /اسم/. ۱. دڵ؛ دل؛ زێل؛ زێلی؛ ئەندامی ماسوولکەیی و هلۆلی لەشی گیانداران کە بە کرانەوە و کۆ بوونەوەی یەکجۆر و لە پەستا، خوێن دەنێرێتە نێو ڕەگ و ڕەگیلەکانەوە ۲. /ـها؛ قلوب/ /مجازی/ دڵ؛ دل؛ زێل؛ ناوەندی هەست و خۆش ویستن ‹از صمیم قلب: لە کانگای دڵەوە› ۳. جەرگە؛ دڵ؛ زێل؛ نێوان یان ناوەڕاستی شتێک ‹قلب جبهەی جنگ: جەرگەی بەرەی شەڕ› ٤. واژی؛ ئاوەژوو؛ پێچەوانە؛ وشەیێ کە بە پێچەوانە نووسین یان خوێندنەوەی پیتی وشەیەکی‌تر دروست دەبێت (وەک «خۆش» و «شۆخ») ٥. کار و ڕەوتی دەس تێوەردان؛ سەر و بن‌کردن؛ شێواندن؛ ئاڵۆز کردن.

▣ **قلب چوب:** ناوزێڵەی چێو؛ ئاڵقەی ناوەندی کۆتەی دار کە لە چاو ئاڵقەکانی دی، کۆنتر و بۆرترە.

**قلب لشکر:** ناوەندی لەشکەر؛ ناوەڕاستی لەشکر؛ جەرگەی لەشکر.

**قلب ماهیت:** شێواندنی چۆنیەتی؛ گۆڕانی چیەتی؛ گوڕانکاری لە چۆنیەتی یان تایبەتمەندی شتێکدا.

▣ **قلب کسی از جا کنده شدن:** /مجازی/ دڵی کەسێک داکەوتن؛ دڵی کەسێ داخورپان (لەبەر ترس، تووڕەیی یان ...).

**قلب کسی گرفتن:** دڵی کەسێک داگیران/ کپ بوون؛ هەست بە کپ‌بوونەوە و گیراوی لە سەرسینگدا کردن.

**قلب**[2]: صفت. /گفتاری/ دەغەڵ؛ زەغەل؛ زەغەڵ؛ خرش؛ ڕەشۆکی؛ سهر؛ سهرک؛ درۆیی؛ قەلب ‹پول قلب: سکەی دەغەڵ›.

**قلب‌الاسد** / qalbol'asad/: [عربی] /اسم/. /نجوم/ دڵەشێر؛ ئەستێرەی ئاڵفای وێنەی گەردوونی شێر، کە بە بۆنەی جێگرتنی خۆر لەو کەلووە لە مانگی گەلاوێژدا، گەرمای بەتینی جەرگەی هاوینیان بەوە ناو نراوە.

**قلب‌العقرب** / qalbo'aqrab/: [عربی] /اسم/. /نجوم/

دڵەدووپشــک؛ هەســارەی ئاڵــفای کــەلووی دووپشک.

**قلبی** / qalbî/: [عربی] *صفت.* دڵـی؛ پێوەندیـدار یان سەر بە دڵ.

**قلپ** / qolop ، ـها/: *اسم.* *[گفتاری]* قـوم؛ قوڵـپ؛ گوڵـمیتە؛ قـۆرت؛ قولـوپ؛ چـۆڕ؛ قـورچ؛ تکـێ؛ گولپ؛ گۆپ؛ قڕ؛ مژ؛ گەپە؛ قـورم ‹یـک قلـپ آب بخور: قومێک ئاو بخۆ›.

**قلت** / qellat/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* کـەمی؛ کمـی؛ کێمــایی؛ کەمایــەتی؛ کــەمێتی؛ هنــدکایی؛ کەمیەتی ‹قلت سواد: کەمی سەواد›.

**قلتبــان** / qaltabān ، ـهـا؛ ـان/: [؟] *اسم.* *[ادبـی]* جاکەش؛ جاکێش؛ جاشکێش؛ دەویت.

**قلتشن** / qoltašan ، ـهـا/: *صفت.* *[کنایی، گفتاری]* کەڵەگا؛ گـامێش؛ قولتـەش؛ قولتەشـە؛ تـووش؛ مرۆی نەفامی توندەمەزاج.

**قلچمـاق** / qolčomāq ، ـها؛ ـان/: [ترکـی] *صفت.* *[گفتــاری]* زنتــۆڵ؛ زەبــەلاح؛ گنێخــە؛ خــرتی؛ ملئەستوور؛ ملقەوی؛ ملپان؛ قەبـەدای؛ تـەژە؛ قۆڵچماغ؛ خاوە ئەستێن؛ زلی زۆربێژ ‹این کار چند کارگر قلچماق لازم دارد: ئـەم کـارە چەنـد کرێکـاری زنتولـی پێویستە›.

**قلدر** / qoldor ، ـها؛ ـان/: [ترکی] *صفت.* *[گفتـاری]* ملهوڕ؛ قوڵدر؛ شـەلات؛ یارمبـاز؛ کەڵەمەشـکێن ‹آقا قلـدر محـل بـود و زور مـی‌گفـت: کـابرا ملـهوری گەڕەک بوو، زۆربێژی دەکرد›.

**قلدری** / qoldorî ، ـهـا/: [ترکـی] *اسم.* *[گفتـاری]* قولدری؛ ملـهوڕی؛ شـەلاتی؛ یارمبـازی؛ کـاری کەڵک وەرگرتن لە زۆر بە جێی عەقڵ و ژیری.

**قلع** / qal'/: [عربی] *اسم.* زریچ؛ ژریژ؛ مز؛ قـەلایی؛ قالایی؛ قەلای؛ قەلا؛ کەلناس؛ توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ۵۰ و کێشی ئەتومی ۱۱۸,۶۹، سپی مەیلەو شین، بریقـەدار، نـەرم و چەکوشخۆر، کە بۆ چێکرنی تەنەکە و ئالیاژی‌تر بە کار دێ.

**قلع و قمع** / qal'-o-qam'/: [عربی] *اسم.* *[ادبـی]* قەڵت و بڕ؛ کوشت و بڕ؛ پشت و بڕ؛ قڕ؛ قەلاچۆ؛ قەراچۆ؛ کار و ڕەوتی کوشتن و تەفروتوونا کردن (لە مەڕ تاقمی مرۆ بەتایبەت پارتێکی خەباتکارەوە).

**قلعه** / qal'e ، ـها/: [معرب از کردی] *اسم.* قەلا؛ قەلا؛ قـلا؛ قـەلات؛ کەلەهـ ؛ کەلـە؛ کەلهـە؛ کـەلات؛ کەلێ؛ کەل؛ هەسار؛ برج؛ دزە؛ دژ؛ دز؛ شـورحە: ۱. /قِلاع/ خانووبەرەیێ بە دیواری بـەرز، دەرکـی پتەو، گۆیـاری و چـەکومـەکی بەرگریـەوە بـۆ حەوانەوە لە تاو دژمن ۲. *[قدیمی]* گوند یا مـەزرا و ماڵــی پــاوانکراو ۳. دۆخێــک لــە گەمــەی شەترەنج.

◙ **قلعەی بزرگ**: قەلای گەورە؛ دۆخێ لە کایەی شەترەنج کە ڕوخ دێتە جێـی فیلـی وەزیـر و شا دەچێتە جێی وەزیر.

**قلعەی کوچک**: قەلای بچـووک؛ دۆخێـک لـە گەمەی شەترەنج کە ڕوخ دێتـە جێـی فیلـی شا و شا دەچێتە جێی ئەسپ.

◙ **قلعه رفتن**: قەلا چوون؛ دانانی شا لـە قـەلای گەورە یان چکۆلە، لە کایەی شەترەنجدا.

**قلعەبـان** / qal'ebān ، ـان/: [معـرب/ فارسـی] *اسم.* دژدار؛ دزدار؛ قەلاچی؛ گۆیار؛ نگابانی قەلا.

**قلعـی** / qal'î/: [عربـی] *صفت.* زریچـی؛ ژریـژی؛ دروست کراو لە کانزای زریچ.

**قلفتی** / qeleftî/: [عربی] ☜ **غلفتی**

**قلفه** / qalafe/: [عربی] *اسم.* *[کالبدشناسی]* چـووک؛ پێستە چرچـەی سـەر کێـر کـە لـە خەتەنـەدا زۆرتری دەچێ: **قلند**

**قلق** / qeleq ، ـها/: *اسم.* ۱. [ترکـی] خـۆ؛ ئاکـار؛ خوو ‹بد قلق: بەو خو› ۲. [ترکی] شێوە ‹قلق کار را پیدا کن!: شێوەی کارەکـە بـدۆزەوە!› ۳. [از عربـی] *[ادبـی]* دڵــخورتی؛ دڵخورپــێ؛ خــرتوپــرت؛ ورتەورت؛ دڵەڕاوکێ.

◙ **قلق چیـزی را بـه دسـت آوردن**: لـە فـووتی شتێک زانین؛ هاتنە دەست؛ فێر بوونی چلۆن

کار پیٚ کردن.

**قل ـ قل** / qolqol/ ☜ **قُل**

**قلقلک** / qelqelak ، ـها/: اسم. ختیلکـه؛ ختکـیٚ؛ ختکه؛ ختیٚ؛ ختلیٚ؛ ختۆکه؛ خدیکه؛ خدووکـه؛ خـدووک؛ خوتووکـه؛ ختوولکـه؛ ختووکـه؛ ختەپتیٚ؛ ختخت؛ ختخته؛ ختـی‌متـیٚ؛ ختـگ؛ قدیلکـه؛ قانەقـدیٚ؛ قدغـه؛ قدیلـه؛ دقدقـه؛ قدقـدانک؛ قلـیٚ؛ قـدیلکانیٚ؛ دنەیـەکی پیٚکـەنین‌هـیٚن کـه بـه هـۆی بزوانـدنی ماسـوولکەیەکی نـەرمی لـەش بـه قامـک یـان شتیٚکی‌تر بەدی دیٚ: **غلغلک**

▣ **قلقلـک دادن**: قدیلکـه/ ختکـیٚ دان؛ ختـگ دایـن؛ ختلـه دایٚ؛ دقدقانـدن؛ دەقدەقانـدن؛ دەقدەقین ‹پهلویش را قلقلک می‌دادم و می‌خندید: بن پالیم قدیلکه دەدا و پیٚدەکەنیٚ›.

**قلقلک کسی آمدن**: قدیلکه هـاتنی کەسیٚک؛ ختکیٚ هاتنی کەسیٚک؛ ختووکه هاتن؛ ختلـه ئامەیٚ ‹وقتی زیر پایم را می‌شُست قلقلکم مـی‌آمـد: کاتیٚ ژیٚر پیٚمی دەشۆرد قدیلکەم دەهاتیٚ›.

**قلقلکـی** / qelqelakî ، ـهـا/: صفت. *[گفتـاری]* قدیلکـەییٚ؛ ختلـەین ‹از بچگـی قلقلکـی بـود: لـه منداڵیەوه ختلەیین بوو›: **غلغلکی**

**قلقلی** / qelqelî ، ـها/: صفت. *[گفتـاری]* خڕکەڵـه؛ گردەڵه؛ خرت؛ خرتەڵه.

**قلک** / qollak ، ـهـا/: [از کـردی] اسم. قووڵـەک؛ دەخیله؛ دەخڵ؛ قولەکه؛ خەزانیٚ؛ سـندووقیٚکی چکۆله که بەتایبەت منـداڵان پووڵـی تیٚـدا کـۆ دەکەنەوه.

**قلل** / qolal/: [عربی] جمعِ ☜ **قُلّه**

**قلـم** / qalam/: [معـرب از یونـانی] اسم. قەڵـەم: ۱. ـهـا/ ئاڵاٚ؛ خامـه؛ پیٚنـووس؛ بنـووس؛ کلـک؛ کیلـک؛ دارینـه؛ ئـامرازی نووسـین ۲. *[مجـازی]* توانایی و لیٚهاتوویی نووسەری ‹قلم شیوایی داشت: قەڵەمیٚکی پاراوی بوو› ۳. *[مجازی]* شیٚوەی خـەت ‹قلم حروف این کتاب زیباست: قەڵەمی پیتەکانی ئەم کتیٚبه جوانه› ٤. ـهـا/ هـەموو جـۆره ئـامیٚریٚکی ئاسنی نووک تیژی دەستی که بۆ بڕین، کۆڵین، کیٚڕان و ... به کار دیٚ ٥. ـها/ *[کالبدشناسی]* هەر یەک له ئیٚسکه دریٚژەکانی دەست و پیٚ ٦. ـها؛ اقلام/ یەکەی ژماردنی ماک و بابەتی پیٚرسـتیٚک ۷. *[نجوم]* ویٚنەیـەکی گـەردوونی باشـووری لـه نیٚوان کۆتر و چۆمدا.

▣ **قلم پا**: قەڵەمه؛ قوله/ قەڵەم/ قەڵـەمەی پـیٚ؛ ئیٚسکی گەورەی لاق.

**قلم خودنـویس**: پانـدان؛ خۆنـووس؛ قەڵـەمی خۆنـووس؛ ئـەو قەڵـەمەی جەوهـەری تیٚ‌دەکریٚ.

**قلم درشت**: ۱. قـامر؛ قەڵـەم‌خـەت؛ قەڵـەمی زەل که گەوره بنووسیٚت ۲. *[مجازی]* بەشیٚکی زۆر؛ ئەندازەی زۆر ‹یک قلم درشت از پول‌هـایش را به عروسش بخشید: بەشیٚکی زۆر لـه پووڵـەکانی دا به بووکەکەی›.

**قلـم راپیـد**: ڕاپیـد؛ ڕاپیـدۆگراف؛ قەڵـەمیٚکی تایبەت بۆ نەقشەکیٚشی.

**قلـم فرانسـه**: قەڵـەمی فەڕانسـه؛ قەڵـەمیٚکی چیٚوی دریٚژ به نـووکی کـانزایی باریکـەوه بـۆ نووسینی خەتی لاتینی.

**قلم مو** ☜ **قلم‌مو**

**قلم نی**: قامر؛ قەڵـەم خـەت؛ قەڵـەم قـامیش؛ قەڵەمی زەل.

▣ **قلم زدن**: ڕمبی قەڵەم‌دان؛ قەڵـەم سـوینەوه؛ نووسین.

**قلم شدن**: قەڵەم/ قەڵەمه بوون؛ قـرپ بیـەیٚ؛ شکانی ئیٚسکه دریٚژەکانی دەست و پیٚ ‹افتاد، پـایش قلم شـد: کـەوت، پـای قەڵـەمه بـوو›.

هەروەها: **قلم کردن**

**قلم شکستن**: *[کنایی]* قەڵەم/ پیٚنووس شـکاندن؛ له نووسین و کاری نووسەران بەرگری‌کردن.

**قلم کشیدن**: خەت‌کیٚشان؛ لابردن: ۱. به سەر نووسراوەیەکدا خەت‌کیٚشان ۲. *[مجـازی]* فـت

کردن؛ قەدکردن. هەروەها: **قلم گرفتن**

**قلم گرفتن** ☜ **قلم کشیدن ـ ۲**

**از قلم افتادن**: لە بیر چوون؛ نووسینی شتێ لە بیرکردن ‹نام چند نفر از قلم افتاده بود: ناوی چەند کەس لە بیر چووبوو›. هەروەها: **از قلم انداختن**

**قلماسنگ** / qalmāsang ، ـها/: ☜ **فلاخن**

**قلم‌انداز** / qalamandāz/: [معرب/ فارسی] *صفت*. سەردەسی؛ پەلەنووس؛ بەلەزنووسراو؛ نووسراوەی بە پەلە ‹دو سطر قلم‌انداز کرد و داد بە دستم: دوو دێری سەردەسی نووسی و دایە دەستمەوە›.

**قلمبه** / qolombe, qolonbe/: *صفت. [گفتاری]* ۱. هەڵتۆقیو؛ ماسیوو؛ باکردە؛ هەڵماسیگ؛ پفکردگ؛ دەرپەڕیو ‹جیب قلمبه: گیرفانی هەڵتوقیو› ۲. زۆر؛ فرە؛ فریە ‹یک پول قلمبه: پارەیەکی زۆر› ۳. ڕەق؛ قاپە؛ دژوار ‹حرف‌های قلمبه: قسەو باسی ڕەق› * **قلنبه**

▣ **قلمبه حرف زدن**: قسەی ڕەق/ سەخت‌کردن؛ قسەی زل‌کردن؛ قسەی پوتی وتن؛ ئاخافتنی زلە- زلە؛ ڕەق قسەکەردەی.

**قلمبه شدن**: هەڵتۆقین؛ هەڵماسین؛ پف‌کردن؛ دەرپەڕین؛ بەرپڕەی؛ پەنەمان. هەروەها: **قلمبه بودن**

**قلمبه ـ سلمبه** / qolombesolombe/: *صفت. [گفتاری]* قاپە؛ ڕەق و تەق؛ دژوار و نالەبار.

**قلم‌تراش** / qalamtarāš ، ـها/: [معرب/ فارسی] *اسم*. کێرک؛ قەڵەمبڕ؛ قەڵەمتاش؛ قەڵەم‌تراش؛ قەڵەم‌تەراش؛ چەقۆی چکۆلەی گیرفانی.

**قلمداد** / qalamdād/: [معرب/ فارسی] *صفت*. هەژماردراو؛ بە حەسێب هاتوو؛ وەبەر چاو هاتوو.

▣ **قلمداد شدن**: بە حسێب/ حەسێب هاتن؛ وە بەر چاو هاتن؛ لە بەر چاو بوون؛ ژمێردران؛ لە بەر چاو گیران ‹او هم در شمار نویسندگان قلمداد شد: ئەویش لە ڕیزی نووسەران بە حسێب هات›.

هەروەها: **قلمداد کردن**

**قلمدان** / qalamdān ، ـها/: [معرب/ فارسی]/*اسم*. قەڵەمان؛ قەڵەمدان؛ قووتوی قەڵەم و مەرەکەف.

**قلمدوش** / qalamdûš/: [معرب/ فارسی] *صفت*. قەلادۆش؛ قەلاندۆش؛ قەلادۆشە؛ قەلاندووش؛ قەلاندۆشکان؛ قەلادۆشکێ؛ قەلاودۆشان؛ قەلاتۆشکێ؛ قەلادوشان؛ کوک؛ تلیقانێ؛ سواری سەرشانی کەسێک.

▣ **قلمدوش کردن**: خستنە قەلاندۆش؛ لە سەر قەلاندووش دانان؛ نیانە قەلادووشان؛ کەسێ نانە سەر شان.

**قلمرو** / qalamrow ، ـها/: [معرب/ فارسی]/*اسم*. ۱. مەڵبەند؛ ناوچە؛ ولکە؛ ئولکە ‹قلمرو حریم کردستان: مەڵبەندی هەرێمی کوردستان› ۲. بوار؛ بەستێنی هەڵسوکەوت و تێیدا کارکردن ‹قلمرو ادبیات: بواری وێژەوانی›.

**قلمزنی** / qalamzanî/: [معرب/ فارسی]/*اسم*. ۱. هونەری کۆڵینی نەخش و نیگار لە سەر کانزا ۲. /ـها/ شتێکی کانزایی کە بە سەریەوە نەخش و نیگار کۆڵرابێ.

**قلمستان** / qalamestān ، ـها/: [معرب/ فارسی]/*اسم*. ۱. باخەنەمامە؛ نەمامگە؛ شەتڵگە؛ کوشگرە؛ باخلە؛ شێنە؛ شەتڵ؛ شەتکجاڕ؛ شوێنێ کە نەمامی تێدا بار دێنن تا کاتی خۆی بگۆزرێتەوە بۆ ناو باخ ۲. بێشە؛ بێشەلان؛ شوێنێ کە تێدا نەمامی داری بێ‌بەر، بۆ چێوەکەی دەکێڵن.

**قلمکار** / qalamkār/: [معرب/ فارسی]/*اسم*. قەڵەمکار؛ باسمە؛ کووتاڵی چیت یان هاورێشمی دەسکرد کە بە مۆری چێوی نەخشرابێ.

**قلم‌مو** / qalam.mû ، ـها/: [معرب/ فارسی]/*اسم*. قەڵەموو؛ پرچۆک؛ قەڵەمێ کە سەرەکەی لە مووە و بۆ وێنەکێشان بە کار دێ.

**قلمه** / qalame ، ـها/: [معرب/ فارسی]/*اسم*. سیخک؛ کەڵەمە؛ قەڵەمە؛ قلوومک؛ قەرەمە؛ قەرەم؛ قەرم؛ لقێ لە گیا کە لە لقی سەرەکی

دەکەنەوە و لە زەوی دەنێن تا شین ببێ.

▣ **قلمه زدن:** قەڵەمە لێدان؛ پەل لێدانەوە؛ شێنە لێدان.

**قلمی** / qalamî/: [معرب] صفت. ١. قەڵەمی؛ پێوەندیدار یان سەر بە قەڵەمەوە ‹کار قلمی: کاری قەڵەمی› ٢. لـها/ *[مجازی]* هەنف؛ باریک و درێژ.

▣ **قلمی شدن:** نووسران؛ پێنووس تێوەدران؛ بەتایبەت بە قەڵەم نووسرانەوە ‹این مختصر جهت اطلاع قلمی شد: ئەم کورتە بۆ ئاگاداری نووسرا›.

**قلمی کردن:** نووسین، بەتایبەت بە قەڵەم ‹چند سطری را برایم قلمی کرده بود: چەند دێڕێکی بۆم نووسیبوو›.

**قلنبه** / qolonbe/ ☜ **قلمبه**

**قلند** / qaland/ ☜ **قَلَفه**

**قلندر** / qalandar ، ـها؛ ـان/: [؟]/اسم. سەرپەتی؛ قەڵەندەر؛ چەکەسۆ؛ کەسێ کە گوێی لە داب و نەریتی کۆمەڵگا نیە.

**قلندری** / qalandarî ، ـها؛ ـان/: [؟]/اسم. سەرپەتیگەری؛ قەڵەندەری.

**ـ قلو** / qolû, qulû/: [ترکی] پیوأزه. ـوانە؛ ـقولوو؛ لف؛ لە دایک بووی هاوڕێ و لە یەک کاتدا.

**قلوه** / qolve ، ـها/: [از عربی] صفت. *[گفتاری]* گورچیلە؛ ولک؛ خناوکە؛ کولیە.

**قلوه‌ای** / qolve'î/: [از عربی] صفت. گورچیلەیی؛ ولکی؛ لە شێوە و بیچمی گورچیلە.

**قلوه‌سنگ** / qolvesang ، ـها/: [از عربی/ فارسی] اسم. مزگال؛ خڕکەبەرد؛ خڕتک؛ خلک؛ خڕکە؛ خرتل؛ دویل؛ خڕەبەرد؛ وردە کوچک؛ خڕەکۆ؛ ورکەبەرد؛ کەمەی؛ کوچ؛ بەردی خڕیلانەی لە ئەندازەی ٥ تا ١٠ سانتی‌میتری چوارپالوودا.

**قلوه کن** / qolvekan/: [از عربی/ فارسی] صفت. لاکەن؛ یەک جێ هەڵکەنراو.

**قلوه‌گاه** / qolvegāh/: [از عربی/ فارسی]/اسم. لاپەراسوو؛ گۆشتی ژێر پەراسووی مالات.

**قله** / qolle ، ـها؛ قُلَل/: [عربی]/اسم. دوند؛ دون؛ ترۆپک؛ سەرقەل؛ زەنگوڵ؛ سەرقۆپ؛ چڵ؛ چەل؛ چم؛ چیە؛ گاز؛ گل؛ قولە؛ قوللە؛ لووتە؛ لووتکە؛ سن؛ کمت؛ کۆپەک؛ قوتکە؛ قوبکە؛ قۆپکە؛ قلەپۆپە؛ چڵەپۆپە؛ کەمک؛ کەپک؛ کمت؛ کیە؛ کومبرەک؛ کلۆپینک؛ قەلەپۆپە؛ کەپ؛ کڵاوە؛ کوڕ؛ گۆپک؛ پۆپکە؛ کۆپ؛ کڵاوە؛ سەرکاو؛ سەرکڵاوە: ١. بەرزترین شوێنی کێو و بەرزایی ٢. *[کنایی]* دهار؛ بەرزترین جێگە ‹قلهٔ افتخار: ترۆپکی شانازی›.

**قلیا** / qalyā/: [عربی]/اسم. *[شیمی]* ١. باز؛ تێکەڵاوێ کە لە ئاودا یۆنی هیدرۆکسیل بەرەلا دەکا و ئەگەر لەگەڵ ئەسید(ترش)دا تێکەڵ ببێ ئاو و خوێ بەرهەم دێنێ، ملوکوولەکانی پرۆتۆن دەگرن و تورنوسول دەکەنە ئاوی ٢. قەلیاو؛ ماکی سابوون.

**قلیائی** / qalyā'î/: [عربی] ☜ **قلیایی**

**قلیاب** / qalyāb/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[شیمی]* قەلیاو؛ ماکی سابوون؛ کەربۆناتی سودیومی ناڕەسەن کە لە سووتکی گیای ئۆشنان دەگیردرێ و پتر بۆ سابوون دروست‌کردن کەڵکی لێوەردەگرن.

**قلیاخواه** / qalyāxāh/: [عربی/ فارسی] ☜ **بازدوست**

**قلیاخواهی** / qalyāxāhî/: [عربی/ فارسی] ☜ **بازدوستی**

**قلیاخونی** / qalyāxûnî/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[پزشکی]* ڕەوتی هەڵکشانی ڕادەی بازی خوێن یان داکشانی ڕادەی ترشی خوێن بە گەلێ هۆی جۆراوجۆرەوە (وەک خواردنی زۆری ماکی قەلیایی، ڕشانەوە، باڵەفێرە و کەسمۆکی لە ڕادەبەدەر).

**قلیان** / qalyān ، ـها/: [؟]/اسم. قلیان؛ قلیانە؛ قلیانی؛ قەلتە؛ قەندە؛ قەنگە؛ قولون؛ قەلەن؛ قەلن؛ قەلنە؛ قەلوو؛ قەلوون؛ قلیاناوی؛ قەننەی

ئـاوی؛ کۆکـۆس؛ نەرگیلـە؛ نێرگەلـە؛ نارگیلـە؛ سەپەلیک؛ کەرەستەیەک بۆ دووکەڵ کـردن بـە تەماکۆ: **غلیان**

▣ **قلیان چاق کردن**: قلیان چـاخ کـردن؛ ئامـادە کردنی قلیان بۆ کێشانی.

**قلیان کشیدن**: قلیان کێشان؛ قلیاناوی کێشـان؛ قەننەکێشان؛ قلیان کێشتەی.

**قلیـایی** / qalyāyî ، ـهـا/: [عربـی] *صفت. [شـیمی]* بازی: **قلیائی**

**قلیل** / qalîl/: [عربـی] *صفت. [ادبی]* کـەم؛ کـورت؛ کێم؛ هندک ‹مدت قلیل: ماوەی کەم›.

**قلیمـاتیس** / qalîmātîs/: [؟] *اسـم.* گوڵـەبروون؛ ڕیشـەپیرانە؛ کوڵـەجان؛ تەربەتمـە؛ بێبـێلاوە؛ گوڵـەزەرد؛ یاسـەمەنی کێـوی؛ ڕوەکێـک لـە ڕەگەزی گوڵاڵەسوورە بە گوڵی ئەرخەوانی یـان سپی و ئاوێکی توون و ژەهراویەوە کە هەندێکی بۆ ئارەق کردنەوە و ڕەوانی بە کار دێ.

**قلیـه** / qalye ، ـهـا/: [عربـی] *اسـم.* قلیـە؛ جـۆرێ چێشتی لـە قیمـە و نـۆک و لووبیـا و چەشـنێ سەوزی (وەک کوولەکە یان ئەسپەناخ و گێزەر).

**ق. م.** / qaf.mîm/: [عربی] *حـرف. [مخفـف]* پ.ز.؛ پێش زایین؛ بەر لە هاتنە دنیای حەزرەتی عیسا.

**قمـار** / qomār, qemār/: [عربـی] *اسـم.* قومـار؛ قوماران؛ قمار: ١. کایە لە سەر بردنەوە؛ هەر کام لەو کایانەی کە بردنـەوە یـا دۆڕانی پێوەنـد بـە هەڵکەوت و لێزانینە و دانەر دەبێ شتێ لە پـای بدا ٢. *[مجازی]* خەتەرکردن؛ خۆ بە ئاو و ئـاگردا دان ‹این کار قمار است چون معلوم نیست چه می‌شـود: ئـەم کـارە قومـارە چونکـوو دیـار نیـە چ دەبـێ›.

هەروەها: **قمار کردن**

**قمارباز** / qomārbāz, qemār- ، ـهـا؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت.* زەحـەل؛ قوماربـاز؛ قومارکـەر؛ قومـارچی؛ خاڵـخاڵ‌بـاز؛ هـۆگر و حـەزۆکی قومارکردن لە سەر پارە.

**قمارخانه** / qomārxāne, qemār- ، ـهـا/: [عربـی/ فارسی] *اسـم.* قومارخانە؛ قومارگە؛ جێگـای قومـار کردن لە سەر پارە.

**قماش** / qomāš/: [عربی] *اسم.* ١. قواش؛ کووتاڵ؛ ماڵی گەزی؛ پارچەی گـەزی؛ قومـاش؛ پارچـە؛ کاڵا؛ چۆخ ٢. تیرە؛ جۆر؛ چەشن؛ بیچم؛ جـنس ‹همه‌ی این‌ها از یک قماشند: هەموو ئەمانە لـە یـەک تیرەن›.

**قمپز** / qompoz/: *اسم. [گفتاری]* بافیش؛ قومپـوز؛ قومپۆز؛ قومبـەز؛ قـۆپز؛ قـوپژ؛ خۆبـەزل‌زانی بـە هۆی قەوم و خزمانەوە.

▣ **قمپز درکـردن**: *[مجـازی]* خـۆ هەڵـنان؛ فیـز کردن؛ خۆ هەڵکێشان؛ لە خۆ فشین.

**قمـــر** / qamar/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* مانــگ: ١. مانگە؛ مۆنگە؛ هەیڤ؛ هاییڤ؛ هەڤـی؛ هـەیو؛ هەیوو؛ هەیویی؛ هەوی؛ کاووت؛ کـاوت ٢. /ـهـا؛ اقمـار/ هــەر تـەنێکی ئاسمـانی کـە لـە دەوری گەڕۆکێکدا بگەڕێ.

▣ **قمر مصنوعی**: سـەتەلایت؛ مانگۆکـە؛ مـانگی دەسکرد.

▣ **قمر در عقرب بودن**: *[مجـازی]* خـم شـێویان؛ زۆر نالەبار بوون ‹این روزها اوضاع قمـر در عقـرب است: بـار و دۆخـی ئـەم ڕۆژانـە خـم شـێویانە›.

هەروەها: **قمر در عقرب شدن**

**قمری** / qamarî/: [عربی] *صفت.* مانگی؛ هەیڤـی؛ ڕێکخراو بە گـوێرەی سـووڕخواردنی مانـگ بـە دەوری زەویدا.

**قمری** / qomrî ، ـهـا/: [عربـی] *اسـم.* کوکـوختی؛ گوگـوختی؛ کوکـوو؛ کووکـوو؛ کووکـووختی؛ کووکووکەرە؛ کۆترەباریکە؛ کۆترەبەرجیلە؛ کۆقۆ؛ فاتمۆک؛ کلوور؛ کۆرک؛ یاکەریم؛ یاهوو؛ فاتـک؛ فاتنک؛ کۆتـەڵ؛ نۆتـاک؛ تووتـاک؛ کەفـۆکرک؛ وەناوکە؛ قومری؛ ترێنە؛ ترێنکە؛ تفتیلک؛ توویل؛ تقیرک؛ تقلک؛ تقیلک؛ ویسـنی؛ ڕەگـەزێک لـە کۆتر بە جەستەی لەڕ، سـەری بچـووک و ملـی بەرزەوە کە پەڵەی ڕەنگامەی لە سەر ملە.

**قمصـــور** / qamsûr/: *صفت. [گفتـاری]* خـراپ؛ چەوت؛ خەسار؛ خراو؛ زایە؛ نارێک.

**قمقمه** / qomqome ، ـها/: [عربی]/*اسم.* قمقمۆک؛ قومقمـۆک؛ قمقمۆکـە؛ قومقموکـە؛ قومقومـە؛ قومقومـێ؛ قمقمـێ؛ گومگـوم؛ گومگومـە؛ گومگمۆکـە؛ تونگـە؛ بقبقـە؛ ئاڤـدەڤ؛ دەفـری بچووکی تراو هەڵگرتن ‹قمقمـەی آب: قمقمـۆکی ئاو›.

**قمه** / qame ، ـها/: [ترکی]/*اسم.* قەمە؛ قام؛ قەممە؛ قـەمێ؛ کـاهوور؛ تیخێکـی دەم پانـە لـە نێـوان خەنجەر و شیردا.

▣ **قمه زدن:** قەمە لێدان؛ قەمە وەشاندن.

**قمەزنی** / qamezanî ، ـها/: [ترکی/ فارسـی]/*اسـم.* *[شـیعە]* کـاری قەمەکێشـان؛ قەمــە لێــدان؛ ڕێورەسمی شینگێڕی بۆ شـەهیدانی کەربـەلا، بە لێدانی قەمە بە سەر سەری خۆدا.

**قمیش** / qamîš/: [ترکی]/*اسم.* ۱. *[تعریض، گفتاری]* عیشوە و ناز؛ لار و لەنجە؛ لەنجە و لار؛ کاکشیر؛ قنجکـە؛ قنجـە؛ قیتـەقیت؛ خـنج؛ خنجکـە؛ قنجەقنج ۲. فیقەنە؛ پیـک؛ نـاڵ؛ زمانـەی بـڕێ ئامرازی مووسیقایی (وەک فلووت و قەرەنەی).

▣ **قمیش آمـدن:** *[تعـریض]* عیشـوە و نـازکردن؛ قنجـەقنج‌کـردن؛ لەنجـە و لارکـردن؛ خـۆ شەکاندنەوە؛ وێ شۆکنایوە؛ قیتەقیت‌کردن.

**قنات** / qanāt ، ـها؛ قَنَوات/: [عربی از سریانی]/*اسم.* کارێز؛ کارێزە؛ کەرێزە؛ کەرێز؛ کەهریز؛ کـەهرێز؛ کەرێز؛ قەنات؛ نۆین؛ ئاوەڕۆی ژێرزەوینی کە بـە مەبەستی گەیاندنی ئاوی بناران بۆ نزمان لە ژێر زەویدا هەڵدەکەنرێ.

**قناد** / qannād ، ـها؛ ـان/: [از عربی]/*اسم.* قـەناد؛ شیرینی‌پێژ؛ کەسێ کە کـاری دروسـت‌کـردن و فرۆشتنی شیرینیە.

**قنادی** / qannādî/: [از عربی]/*اسم.* شیرینی‌خانـە؛ قەنادی: ۱. /ـها/ فرۆشگای شیرینی ۲. پیشـەی شیرینی‌پێژ ۳. /ـها/ کارگەی شیرینی پێژی.

**قناره** / qanāre ، ـها/: [عربی از فارسی]/*اسم.* قەنارە؛ قنـاڵ؛ چنگـەک؛ چنگاڵـە؛ چەنگـەک؛ ئاسـنی گۆشت پێداهەڵواسینی قەسابان.

**قناری** / qanārî ، ـها/: [اسپانیایی]/*اسم.* قـەناری؛ کـەناری؛ کنـاری؛ کـەنارە؛ جونـە؛ پەلـەوەرێکی چووکەڵەی زەردی دەنگ‌خۆشە لە بلبل دەکا.

**قناس** / qenās/: *صفت.* قەناس؛ قەنگاس؛ نارێک: ۱. بە چەن کونج و گۆشەی گێر و جۆراوجۆرەوە ۲. *[مجازی]* نالەبار؛ گێرگوار؛ گێڕ و وار.

**قناسی** / qenāsî ، ـها/: *اسم.* قەناسی؛ لار و گێڕی؛ دۆخ یان چۆنیەتی قەناس بوون.

**قناعـت** / qanā'at, qenā'at ، ـهـا/: [عربـی]/*اسم.* دەس‌پێوەگری؛ نەوس‌کوژی.

▣ **قناعت کردن:** ۱. قەناعەت‌گرتن؛ دەس پێـوە گرتن ۲. زێدە نەخواستن؛ نەوس‌کوشتن.

**قناویز** / qanāvîz/: *اسم. [قدیمی]* خامـەک؛ خـام؛ قەنەوز؛ قەناوێز؛ پارچەیەکی هەورێشمی ساکارە لە ڕەنگی ئەرخوان دەکا.

**قنبـــرک** / qambarak, qanbarak/: *اسـم.* دەسەزرانی؛ دەستەوئەژنۆ؛ دەستەژنۆ؛ چۆکانێ.

▣ **قنبرک زدن:** چۆک هەڵـدان؛ هەڵتروشـکان؛ هەڵـچیچەکان؛ هەڵـتووتەکان؛ هەڵـتووتان؛ هەڵتوروشکان؛ هەڵتوترین؛ پەنجە هەڵپێکان؛ دانیشتن بە شێوەیێ کە هەر دوو دەسـت لـە ئەژنۆ هەڵپێکرێ.

**قنبـل** / qombol, qonbol ، ـهـا/: *اسم. [گفتـاری]* سمت؛ سمتە؛ تەڕاف؛ سـوورین؛ قاڵـچە؛ قۆڕک؛ کەفەڵ بەتایبەت کاتـێ کـە زۆپ و زوت بێ.

**قنـد** / qand ، ـهـا/: [معـرب از سنسـکریت]/*اسم.* ۱. قەن؛ قەند؛ خەند؛ بەرهەمی بلۆرینی سـپی و شیرینی چۆنەری قەند یـان قـامیش ۲. *[کنـایی]* هەر شتێ کە چێژەی شیرینە ۳. *[شیمی]* شەکر؛ هەر هیدرات کەربۆنێکی شیرین.

▣ **قند انگور:** شەکر/ قەنی ترێ؛ دیکستڕۆز.

**قند خون:** شەکر/ قەنی خوێن؛ ماکی قەندی خوێنی مۆرغەداران.

**قند شیر:** شەکر/ قەنی شیر؛ لاکتۆز.

**قند مالت:** شەکر/ قەنی مالّت؛ مالّتۆز.

**قند میوه:** شەکر/ قەنی میوه؛ فرۆکتۆز.

**قند نیشکر:** شەکر/ قەنی نەیشەکەر؛ قەنی چۆنەر؛ ساکارۆز.

▣ **قند توی دل کسی آب شدن:** *[کنایی]* گەز-گەز بالا کردنی کەسێک؛ لە خۆشیان پێ وە هەرد نەکەوتن؛ زۆر خۆشحالّ بوونی کەسێک ‹از دیدن پسرش در لباس دامادی قند توی دلش آب می‌شد: کە کوڕەکەی دەدیت بەرگی زاوایی لە بەرە، گەز-گەز بالای دەکرد›.

**قنداب** / qandāb/: [معرب/ فارسی]/*اسم.* ئاوقەند؛ شەربەت قەن؛ قەنداو؛ ئاوێ کە قەندی تێدا توابێتەوە.

**قنداق** / qondāq/: [ترکی]/*اسم.* قۆنداخە؛ قونداخ؛ قۆناخ؛ قۆناغ؛ قۆناخە؛ قۆنداخ؛ قونداغ: ۱. قوماتە؛ پاچۆلک؛ پێ‌چولک؛ قومات؛ بابۆلە؛ کوماتەک؛ کلپێچک؛ کووتالێ کە لە سنگ بەرەوخواری منداڵی تێوە دەپێچن ۲. *[ـها/* قاو؛ قوناخە؛ بەشی پاشەوەی تفەنگ کە لە چێو یان ماکێکی سووک و پتەوە.

▣ **قنداق کردن:** قەمتاندن؛ مەلۆتکەکردن؛ مەلۆرتک کردن؛ بابۆلەکردن؛ قۆناخەکردن؛ بابۆلەپێچ‌کەردەی.

**قنداقی** / qondāqî/: [ترکی] *صفت.* ۱. مەلۆتکەیی؛ مەلۆرتکی؛ لەبار بۆ بابۆلەکردن ‹پارچەی قنداقی: قوماشی مەلورتکی› ۲. مەلۆتکە؛ تەمەنی قونداغ کردنی منداڵ ‹بچەی قنداقی: زارۆی مەلۆتکە›.

**قندان** / qandān، ـها/: [معرب/ فارسی]/*اسم.* قەندان؛ قەندوو؛ دەفرێکی چکۆلە بۆ جێی کلۆقەن.

**قندپهلو** / qandpahlû/: [معرب/ فارسی] ☜ چای دیشلمە، **چای**

**قنداغ** / qandāq/: [معرب/ فارسی]/*اسم.* قەنداخ؛ ئاوگەرم و قەن؛ ئاوی داخی بە قەن شیرین‌کراو.

**قندران** / qandarān/ ☜ **قندرون**

**قندرون** / qandarûn/: *اسم. [گفتاری]* جەوی: ۱. بنێشت؛ جاچکە؛ وێژەن؛ سەقز ۲. قاچک؛ قاژک؛ چەقە؛ جۆرێک کائوچۆ کە لە ڕیشەی شنگ بەرهەم دێ و دەیجاون ❋ **قندران**

**قندسنج** / qandsanc، ـها/: [معرب/ فارسی]/*اسم.* شەکرپێو؛ ئامرازێکی تایبەت بۆ پێوانی ڕادەی شەکری تراوێک بەتایبەت خوێن.

**قندشکن** / qandšekan، ـها/: [معرب/ فارسی]/*اسم.* قەندشکێن؛ قەن‌شکێن؛ قەنەشکێن؛ قەن‌ئشکن: *الف)* چەکوچی قەند شکاندن *ب)* قەن‌بڕ؛ قەن‌مار؛ جۆرێ گازی دەم تیژ، قەنی پێ دەبڕن.

**قندگیر** / qandgîr، ـها/: [معرب/ فارسی]/*اسم.* قەنگر؛ مەقاشێکی بچووک بۆ هەڵگرتنی کلۆ قەند.

**ـ قندی** / qandî/: [معرب] *پیوازه.* ـقەندی؛ ـقەنی؛ ـشەکری؛ قەندار ‹دوقندی: دووقەندی›.

**قندیل** / qandîl، ـها/: [معرب از یونانی]/*اسم.* ۱. *[قدیمی]* چرایێ کە بە بن میچ یان دیوارەوە هەڵیاندەواسی ۲. قەندیل؛ چلوورە؛ بەیسە؛ گلیلە؛ گلیزە؛ سوولەڕمە؛ سوولەرمە؛ زەمەگلێرە؛ ژەکلێرە؛ مووم؛ ئەوەی وەک قەندیل لە شوێنێکەوە شۆڕ دەبێتەوە.

▣ **قندیل یخ:** شیشەسۆڵ؛ شووشەسەهۆڵ؛ شوشەسۆل؛ شووشە یەخ.

**قنسل** / qonsol/: [معرب از فرانسوی] ☜ **کنسول-۱**

**قنسول** / qonsûl/: [معرب از فرانسوی] ☜ **کنسول - ۱**

**قنسولخانه** / qonsûlxāne/: [معرب/ فارسی] ☜ **کنسولگری**

**قنسولگری** / qonsûlgarî/: [معرب/ فارسی] ☜ **کنسولگری**

**قنطره** / qantare/: [عربی]/اسم. قەمتەرە؛ قەنتەرە؛ قەنتەر؛ قەینتر: ١. پردی لە ئاو پەڕینەوە ٢. ئاوبارە؛ لووتک؛ بەلک؛ بۆتک؛ بۆت؛ قەم؛ داری درێژ و ئەستوور و کۆڵدراو کە بۆ پەڕاندنەوەی ئاو، بە سەر کەندالیدا دەکێشن و دەبێتە جۆگە.

**قنطورس** / qantûros/: [معرب از یونانی]/اسم. [نجوم] قەنتووروٚس؛ کۆمەڵە ئەستێرەیێکی باشوورییە.

**قنوات** / qanavāt/: [عربی] جمعِ ☜ **قنات**

**قنوت** / qonût, qunût/، ـها/: [عربی]/اسم. [اسلام] قونووت؛ قوونووتە؛ دۆعایەکی نوێژە بەتایبەت دوای ڕەکاتی دووەم: الف) [سنی] دوای ڕکووع ب) [شیعه] پێش لە ڕکووع.

**قو** / qow/: /اسم. قەو؛ پیفێ؛ چەشنێ کارگی نەرمی وەک چێوپەمەیە کە بڕێ خەڵکی دەشتەکی بۆ هەڵکردنی ئاور کەڵکیان لێ وەردەگرت: **گیرانه**

**قو** / qû/: /اسم. قوو: ١. [نجوم] دەجاجە؛ تایێر؛ وێنەیەکی ئاسمانیە لە نیوەی باکووری زەوی و کاکەشانی ڕێی شیریدا: **دجاجە؛ طایر؛ صلیب شمالی** ٢. /ـها/ باڵندەیەکی ئاویە، بە جەستەی گەورە و گەردنی بەرز و دندووکی تەختەوە کە مەلەی زۆر جوانە.

▣ **قوی خروسکی**: جۆرە قوویەکی قیژنە بە جەستەی سپی، پەڕ و باڵی نەرم و ناوچاوانی زەردی مەیلەو نارنجیەوە: **قوی فریادکش**

**قوی سفید**: قووی سپی؛ قووی چکۆلەی سپیکەلەی دەنگ نەرم.

**قوی فریادکش** ☜ **قوی خروسکی**

**قوی گُنگ**: باڵدارێکی بێدەنگە لە تیرەی قوو، بە لەشی سپی، پەڕی نەرم و دەندووکی سوورەوە.

**قوا** / qovā/: [عربی]/اسم. ١. جمعِ ☜ **قوّه** ٢. هێزی چەکداری.

▣ **قوای امدادی** ☜ نیروی امدادی، **نیرو**

**قوای انتظامی** ☜ نیروی انتظامی، **نیرو**

**قوای تأمینی** ☜ نیروی امنیتی، **نیرو**

**قواد** / qavvād/، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. گەواد. هەروەها: **قوّادی**

**قواره**[1] / qavāre/، ـها/: [عربی]/اسم. قەوارە: ١. بڕکە؛ کووتاڵێ بە ئەندازەی یەک دەست جل ٢. لاتە؛ پارچە؛ بەشە زەوینی تایبەت بە ماڵێک.

**قواره**[2]: صفت. ڕێکوپێک؛ هاولە؛ فیت؛ بە ئەندازەی پڕبەپڕ.

**قواعد** / qavā'ed/: [عربی] جمعِ ☜ **قاعده**[1]

**قوافل** / qavāfel/: [عربی] جمعِ ☜ **قافله**

**قوافی** / qavāfî/: [عربی] جمعِ ☜ **قافیه**

**قوال** / qavvāl/، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. بەیتبێژ؛ کەسێ کە بە ئاوازەوە، هاوکات لەگەڵ لێدانی سازدا شتێک دەخوێنێتەوە.

**قوالی** / qavvālî/: [عربی]/اسم. بەیتبێژی؛ کار و پیشەی بەیتبێژ.

**قوام** / qavām/: [عربی]/اسم. خۆگرتوویی: ١. [ادبی] پتەوی؛ گوریخی؛ گورخی ٢. ما؛ چێشت یان قەنداو و... کە پاش ماوەیەک کولان لێکدەهالێ و هێندێک دەگرسێ. هەروەها: **قوام آمدن؛ قوام گرفتن؛ قوام یافتن**

**قوانین** / qavānîn/: [عربی] جمعِ ☜ **قانون**

**قوت** / qovvat/: [عربی]/اسم. هێز؛ وزە؛ تاقەت؛ تابشت؛ توان؛ توانایی؛ گوڕ؛ زەبر؛ قەوەت؛ قووەت.

▣ **قوت قلب**: هورە؛ وورینگ؛ ورار؛ ورە؛ زراو؛ هەترە؛ هەترەش؛ نەترە؛ پشتووری؛ هێزی دڵ؛ قەوەتی دڵ؛ دڵگەرمی.

▣ **قوت بخشیدن/ دادن**: پشتگرتن؛ ورە پێدان؛ غیرەت وەبەر پا نان. هەروەها: **قوت گرفتن؛ قوت یافتن**

**قوت** / qût/: [عربی]/اسم. [ادبی] بژیو؛ ژەمان؛

ژەمەن؛ داژیار؛ ڕۆزی؛ خۆراس؛ خۆراک؛ مایەی ژیان.

▣ **قوت لایموت**: نە قڕ نە پڕ؛ نەمر مەژی؛ بژی مەمر؛ خۆراکی کەم.

**قوچ** / qûč ، ـها/: [ترکی]/*اسم.* بەران؛ وەران؛ وەرەن؛ وەروەن؛ وەرهان؛ هۆگج؛ بەردێل؛ کەلیجە؛ نێری؛ نیری؛ نێهری؛ سابرێن؛ تەجە؛ تەگە؛ تەکە؛ تگل؛ قۆچ؛ غورچ؛ بەختە؛ شاک؛ کەل؛ کەلەزە؛ شگل؛ نێرەپەزی پێگەیشتوو: **غوچ**

**قورباغه** / qûrbāqe ، ـها/: [ترکی]/*اسم.* بۆق؛ بەق؛ قڕبۆق؛ قربۆق؛ قڕپۆک؛ قرپک؛ قەرواق؛ قورواق؛ قورواقی؛ قرباق؛ قورباقە؛ قەرواقە؛ قڕواق؛ قرواقی؛ قورباق؛ شاقروان؛ شاقرداق؛ هەفتجار؛ کەمچەکۆلە؛ گیانەوەرێکی بەژئاوی کە پتر لە ئاودا دەژی و کلک و ملی نیە و هەڵدەبەزێ: **غورباغه**

**قورت** / qûrt/: [ترکی]/*اسم.* *[گفتاری]* قووت؛ قوویت؛ قووق؛ قوریتک؛ قورت؛ قویت؛ گەپ؛ لەف؛ لرفە (بۆ وڵاخە و بە پلار بۆ مرۆ)؛ کار و ڕەوتی قووت دان و لە قورگ دانە خوار.

▣ **قورت دادن**: قووتدان؛ قویتدان؛ قورچاندن؛ داعووران؛ داوران.

**قورت ـ قورت** / qûrtqûrt/: [ترکی] *صوت.* قلمەقلم؛ گلم ـ گلم؛ گوولم ـ گوولم؛ دەنگی قووت دانی تراو.

**قورخانه** / qûrxāne ، ـها/: [ترکی/ فارسی]/*اسم.* *[قدیمی]* قۆرخانە: ١. کارخانەی چێ کرنی تەقەمەنی ٢. جبەخانە؛ هەماری هەموو چەشنە چەک و تەقەمەنیەک.

**قور ـ قور** / qûrqûr/: *صوت.* قۆڕەقۆڕ؛ قۆڕە؛ قوارە؛ قرەقڕ؛ قیرەقیر؛ جقەجق؛ قرە؛ دەنگی قربۆق و هەر دەنگێکی وەک ئەوە.

▣ **قور ـ قور کردن**: جەرقین؛ جقاندن؛ قڕین؛ قیڕاندن؛ قیڕنەی.

**قورمه** / qorme/: [ترکی] ☜ **قُرمه**

**قوری** / qûrî ، ـها/: [؟]/*اسم.* قۆری؛ قۆڕی؛ قووری؛ قۆریە؛ غۆری؛ چادان؛ چاپەز؛ دەفری خڕی بە لوولە و دەستە بۆ دەم کردنی چای.

**قوز** / qûz/: *اسم.* *[گفتاری]* قۆز؛ کووڕی؛ کۆمی؛ داچەماوی؛ چەماوی؛ داهاتوویی؛ کووکی؛ قووپکی؛ قۆپی؛ کۆفی؛ کووفی؛ قۆقزایی؛ قۆقزی؛ قۆفی؛ قۆغی؛ قۆقی؛ زەقی؛ قۆزایی؛ قیتایی؛ قلووجی؛ زۆپی یان چەمێ کە لە قەفی مۆرەدا پەیدا دەبێ.

▣ **قوز بالا قوز**: *[مجازی]* لکی لای دمەڵ؛ باری سەر باران؛ دەردی سەرباری دەردان ‹مرگ دایی کم بود بیماری بابا هم قوز بالا قوز شد: مردنی خالم بەس نەبوو نەخۆشی بابیشم بوو بە لکی لای دمەڵ›.

▣ **قوز درآوردن**: کۆم بوون/ بوونەوە؛ چەمانەوە؛ کۆم بیەی.

**قوزک** / qûzak ، ـها/: [از کردی]/*اسم.* ١. گۆزەک؛ گوێزنگ؛ گوێزک؛ گووزک؛ گووزەک؛ گوێزینگ؛ قونیک؛ گۆزک؛ کوێزلک؛ قولەفیسکە؛ قولەپێ؛ قولەپا؛ قولەپە؛ قولەپەی؛ قاپەڕەقە؛ چووە؛ قاپ؛ زەنگە؛ زەنگوو؛ زەنگی؛ کاب؛ هوویرک؛ هەر کام لە دوو جمگەی دەرپەڕیوی دوو شانی پاژنەی پێ و بنی لاق ٢. قیتک؛ گرچک؛ چوو؛ کوندیل؛ زۆپی هێلکەئاسای سەری ئێسک کە دەکەوێتە نێو قووڵایی پێشەی ترەوە.

**قوزی** / qûzî ، ـها/: *صفت.* *[گفتاری]* قۆق؛ کووڕ؛ کۆم؛ کووک؛ قۆپ؛ کۆف؛ قلووج؛ قۆف؛ قۆغ؛ قۆقز؛ قۆقن؛ قۆقی؛ کووف؛ پشتدەرپەڕیو؛ پشتچەماو.

**قوس** / qows, qo:s/: [عربی]/*اسم.* کەوان؛ کەوانە؛ کەمان؛ قەوس: ١. ـها/ لاری؛ چەماوەیی؛ چەم ‹قوس ابرو: کەوانی برۆ› ٢. ـها/ *[هندسه]* تەواو یان بەشێ لە چەماوەیێ ٣. *[تقویم]* نۆیەمین بورج لە دوازدە بورجی ساڵ، ڕێکەوتی مانگی

سەرماوەز.

◙ **قوس صعودی**: منحنی صعودی ☜ **منحنی**[1]

**قوس نزولی**: منحنی نزولی ☜ **منحنی**[2]

**قـوس‌قـزح** / qowse-qazah, qo:se-qazah/: [عربی] ☜ **رنگین‌کمان**

**قوسی** / qowsî, qo:sî/: [عربی] *صفت*. کـەمانی؛ کەوانی ‹تاق قوسی: تاقی کەوانی›.

**قوش** / qûš ، ـها/: [ترکی]/*اسم*. ۱. ☜ **شاهین ــ۱** ۲. واشە؛ باشوولکە؛ باشووکە؛ ناوی چەنـد جـور مەلی ڕۆژڕاو لە تیرەی شاهێن ۳. *[گفتاری]* بـاز؛ بازی؛ پەلەوەری ڕاوچی.

**قوشـچی** / qûščî ، ـها/: [ترکـی]/*اسم*. قوشـچی؛ بازپەڕێن؛ بازەوان؛ ئەو کەسەی لە ڕاوە بازدا، بـاز بەرەو نێچیر هەڵدەفڕێنێ.

**قـوطی** / qûtî, qotî ، ـهـا/: [ترکـی]/*اسم*. قوتـوو؛ قووتی؛ قۆدی؛ قوودی؛ قودیـک؛ قـۆتی؛ قوتیـە؛ قووتیە؛ قالـک؛ قالـب؛ دەفرێـک بـۆ هەڵـگرتنی شت، بە بیچمی ڕێک‌وپێک و بنی تەختەوە کـە لە ماکی هـەرزانبایی دروسـت دەکـرێ ‹قـوطی کبریت: قوتووە شەمچە›.

◙ **قوطی بگیر و بنشان**: *[کنایی]* دەسەسەرەکە؛ بـۆ لەکۆڵ‌کردنـەوەی کەسـێ (بەتایبـەت منـداڵ) پێی ئێژن ‹آزاد آمد و گفت: «مامـانم گفـت: قـوطی بگیر و بنشان را بدهید ببرم»!: ئازاد هـات و گـوتی: «دایە پێی گوتم: بچۆ دەسەسەرەکە بێنە»!›.

**قوطی سـیگار**: قـووتی سـیگار؛ قوتـوو سـگار؛ قوتووی جگـەرە؛ قوتـووە جگـەرە. هـەروەها: **قوطی کبریت؛ قوطی دارو**

◙ **در قوطی هیچ عطّاری پیدا نشدن**: *[تعریض]* لە توورەکـەی هـیچ سواڵـکەرێکدا نـەبوون؛ لـە کتێبـی گورگیشـا نەنووسـران؛ زۆر سـەیر و سەمەرە بوون.

**قوقـولی‌قوقـو** / qûqûlîqûqû/: *صـوت*. قۆقـە؛ قووقـوو؛ قـووق؛ قیـق‌لـۆقی؛ قیقـی؛ قووقـە؛ قووقەقووق؛ قوولەقوول؛ قویلـە؛ کووکـە؛ ئـاوازی کەڵەشێر؛ دەنگی خوێندنی کەڵەباب.

◙ **قوقـولی‌قوقـو کـردن**: شـەهین؛ قووقانـدن؛ قووقانن؛ قووقان؛ قویلانن؛ قووقنای؛ کەڵـەباب خوێندن.

**قول** / qowl, qo:l ، ـها/: [عربـی]/*اسم*. ۱. /اَقوال؛ اقاویل/ قسە؛ وتـە؛ گوتـە؛ قسـەیێ کـە کەسـێک گـوتبێتی ‹بـە قـول شـاعر: بـە قسـەی شـاعیر› ۲. بەڵێن؛ بڵین؛ پـەیمان؛ گفـت؛ گفتـە؛ سـۆز؛ سۆست؛ وادە؛ قەول؛ قەوڵ؛ بڕیە ‹قـول کـە درس بخوانم: بەڵین بێ بخوێنم›.

◙ **قول مردانە**: قـەوڵ/ بەڵـێنی پیاوانـە؛ قـەوڵ شەرەف؛ بڕیاری پتەو.

◙ **قول دادن**: بەڵـێن دان؛ پـەیمان دان؛ گفـت دان؛ قەوڵ دان.

**قول گرفتن**: بڕیارگرتن؛ قـەوڵ لـێوەرگـرتن؛ بەڵێن ساندن.

**از قول خود برگشـتن**: پـەیمان/ بەڵـێنی خـۆ شکاندن؛ لە بڕیاری خۆ لادان؛ لە قسـەی خـۆ هەڵگەڕانەوە؛ دان بە ژێر قسەی خۆدا؛ قسە تا سەر نەبردن.

**قولنامه** / qowlnāme, qo:l- ، ـها/: [عربی/ فارسی] /*اسم*. قەوڵنامە؛ بڕیارنامە؛ قەرارنامە؛ بەڵـێن‌نامـە؛ گفت‌نامە؛ نووسینی ئەو شتە (زۆرتر مامەڵـە) کـە دوو یان چەند کەس لە سەری پێکهاتوون.

◙ **قولنامه کردن**: بڕیارنامـە نووسـین؛ قەوڵـنامە کردن؛ نووسین و ئیمزا کـردنی قەرارنامـە لـە هەر دوو لایەنەوە.

**قولنامه‌ای** / qowlnāme'î, qo:l-/: [عربی/ فارسی] *قید*. قەوڵنامەیی؛ بە قەوڵنامە.

**قولنج** / qolanc, qolenc/: [معرب از یونـانی]/*اسم*. کۆڵنج؛ کولنج؛ قۆڵنج؛ قـولنج؛ سـانجن؛ بـرک؛ ئێشی زۆری (زیـاتر نـاو زگ) بـە هـۆی گـرتن و بەردانی ماسوولکە و دەمـاری ئەنـدامێک (وەک زگ، ڕێخۆڵە و...) لە ناو سکدا.

**قولون** / qûlûn, qûlon/: [معـرب از یونـانی]/*اسم*.

بەشی دواییی ڕیخۆڵەی گەورە کە خۆی لە سێ بەش پێکهاتووە و بریتییە لە بەشی بەرەوژوور، بەشی ڕاست و بەشی بەرەوخوار.

**قوم** / qo:m, qowm ، ـها؛ أقوام/: [عربی]/اسم. قەوم: ۱. هۆز؛ خەڵکێ کە بە هۆی ڕەگەز و زمانەوە لێک گرێ دراون ۲. خزم؛ خوێش؛ کرێڤ؛ کریف؛ لێزم؛ خنام؛ قیلە.

**قوم‌پرستی** / qo:mparastî, qowm-/: [عربی/ فارسی]/اسم. هۆزپەرەستی؛ بڕوا بە چاکتری و هێژابوونی هۆزێک. هەروەها: **قوم‌پرست**

**قوم‌شناسی** / qo:mšenāsî, qowm-/: [عربی/ فارسی] ☜ **انسان‌شناسی**

**قوم‌نگاری** / qo:mnegārî, qowm-/: [عربی/ فارسی]/اسم. نووسراوەی سەبارەت بە هۆزناسی.

**قوم و خویش** / qo:m-o-xîš, qowm-/: [عربی/ فارسی]/اسم. کەس و کار؛ کەس‌کار؛ خزم و خوێش؛ قەوم و خوێش.

**قوم‌وخویش‌بازی** / qo:m-o-xîšbāzî, qowm-/: [عربی/ فارسی]/اسم. قەومیگەری؛ قەوموقەومالێ؛ قەومەقەومالێ؛ هۆگرەتی ناڵەبار بە خزم و کەس و سپاردنی پلەی کارگێڕی و دانی سەربەشی پێیان.

**قومی** / qo:mî, qowmî/: [عربی] صفت. خزمی؛ خوێشی؛ پێوەندیدار یان سەر بە هۆزەوە.

**قومیت** / qo:mîyyat, qowmîyyat/: [عربی]/اسم. ۱. هۆز؛ قەوم ۲. خزمایەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هۆز بوون.

**قومیز** / qomîz/: [؟] ☜ **کومیس**

**قومیس** / qomîs/: [؟] ☜ **کومیس**

**قونسول** / qonsûl/: [معرب از فرانسوی] ☜ **کنسول ـ ۱**

**قونسولخانه** / qonsûlxāne/: [معرب/ فارسی] ☜ **کنسولگری**

**قونسولگری** / qonsûlgarî/: [معرب/ فارسی] ☜ **کنسولگری**

**قوه** / qovve/: [عربی]/اسم. ۱. /قوا/ وزە؛ هێز؛ هازی؛ هاز؛ گوڕ؛ کۆسە؛ قار؛ توانا؛ تاقەت؛ تابشت؛ قەوەت ۲. /ـها/ قوە؛ پیلی وشک ۳. /ـها؛ قوا/ هێز؛ هەر کام لە سێ ناوەندی قانوونی لە نیزامی پارلەمانیدا ‹قوەی قضاییە: هێزی داوەری› ٤. *[ریاضی، فیزیک]* تەوان.

▣ **قوەی اجرایی**: هێزی کار؛ هێزی کارکەر؛ ناوەندێ کە ئەرکی بەڕێوەبەری قانوون و ڕێکخستنی کار و باری وڵاتە: **قوەی مجریە**

**قوەی قانون‌گذاری**: هێزی قانوون دانان؛ ناوەندی ڕێکخستن و بڕیاردانی قانوون: **قوەی مقننە**

**قوەی قضائیە/ قضایی**: هێزی دادوەری؛ ناوەندێ کە چاوەدێری لە قانوون دەکا و بەر بەلادانی دەگرێ.

**قوەی قهریە**: فۆرس ماژۆر؛ بار و دۆخێ کە بە زۆرەملێ و هێزەوە لە کوت‌وپڕا ڕوو دەدا و بەری پێ ناگیرێت.

**قوەی مُجریە** ☜ **قوەی اجرایی**

**قوەی مقنّنە** ☜ **قوەی قانون‌گذاری**

**قوی** / qavî ، ـها/: [عربی] صفت. بەهێز؛ بەگوڕ؛ زۆخ؛ زووخ؛ بەقەوەت؛ خورت؛ زنتۆڵ؛ پڕزوو؛ زۆردار؛ قەوەتدار.

**قوی‌بنیه** / qavîbonye ، ـها/: [عربی] صفت. پتەو؛ لەش‌گرس؛ هەڵگە بە پشت؛ بە گوڕ و تاو؛ بەخۆ؛ بە هێز و خۆڕاگر لە بەرانبەر نەخۆشیەوە.

**قوی‌پنجە** / qavîpance ، ـگان/: [عربی/ فارسی] صفت. *[ادبی]* زۆردار؛ بەهێز؛ توانا؛ بەتاقەت؛ پڕزۆر؛ هێزدار؛ وەپەل.

**قوی‌دست** / qavîdast ، ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. بە دەست و دوو: ۱. زۆردار؛ بەقەوەت؛ دەسدار؛ دەسکەن؛ خاوەنی دەستی بەهێز ۲. *[کنایی]* توانا؛ بەهێز؛ دەسڕۆیو؛ دەسچووگ؛ بە دەستەڵات.

**قوی‌دل** / qavîdel ، ـان/: [عربی/ فارسی] صفت.

دلێر؛ ئازا؛ بەجەرگ؛ بوێر؛ بە ورە؛ بە وزە؛ دلاوا.

**قوی‌هیکل** / qavîheykal ، ـها/: [عربی] *صفت.* کەلەگەت؛ بلەرمان؛ هەیکەلی؛ بە قەلافەت؛ لەش درشتی زۆردار.

**قهار** / qahhār/: [عربی] *صفت. [ادبی]* توانا: ١. لێهاتوو؛ بە دەست و برد ‹ملوان قهار: مەلەوانی توانا› ٢. بەهێز؛ بە قەوەت؛ زۆردار ‹دشمن قهار: دژمنی بەهێز›.

**قهر** [1] / qahr/: [عربی] *اسم.* ١. ـها/ قار؛ نقار؛ خاک؛ تۆر؛ توور؛ مت؛ جوونگ؛ بێزاری؛ دوزاخە؛ جارزی؛ دڵئێشاوی وا کە ببێتە هۆی پێکەوە قسە نەکردن یان نەمانی پێوەندی دۆستی ٢. *[ادبی]* زەبر؛ زۆر و گوشار بۆ زاڵ بوون بە سەر کەسێ یان شتێکدا.

**قهر** [2]: *صفت.* قار؛ خاک؛ لووتەلا؛ لالووت؛ دڵخۆر؛ تۆراو؛ تۆریا؛ تووریاگ؛ زویر؛ زیز؛ ڕەنجاو؛ شەمزاو.

▣ **قهر بودن:** لالووت بوون؛ قار بوون؛ خاک بوون؛ نێو چاوان تێکدان؛ بڕان و نەمانی دۆستایەتی و ئاموشۆی دۆستانە ‹از آن روز با من قهر است: لەو ڕۆژەوە لێم لالووتە›.

**قهر کردن:** تۆران؛ تۆریان؛ تووریاین؛ لووت لاگردن؛ تۆریای؛ تۆریەی؛ زویر بوون؛ زیز بوون؛ لووت هەلکردن؛ لالووتی شاندان؛ سڵ بوون؛ قین کردن؛ هەڵفینگانن؛ قت‌کردنی پێوەندی دۆستایەتی.

**قهرآلود** / qahrālûd/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ڕقاوی؛ هاوڕێ لەگەڵ تۆران و تووڕەییدا ‹صدای قهرآلود: دەنگی ڕقاوی›.

**قهرآمیز** / qahrāmîz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* قیناوی؛ ڕق لە زگانە؛ قین لە بەرانە؛ بە زەبر و زۆرەوە ‹مبارزەی قهرآمیز: کێبەرکێی قیناوی›.

**قهراً** / qahran/: [عربی] *قید.* ١. ناچار؛ ناعیلاج؛ ناگوزیر ‹پول لازم دارد، قهراً خانه را می‌فروشد: پارەی دەوێ، ناچار ماڵەکەی دەفرۆشێ› ٢. بە زۆر؛ بە زەبر؛ بە زۆرەملی؛ بە زۆرەملێ؛ زۆپە؛ زۆرەکی؛ خورتی؛ بە خورتی؛ بە تۆپزی ‹قهرا وارد خانه شدند: بە زور چوونە ماڵەوە›.

**قهرمان** / qahramān, qahremān ، ـها؛ ـان/: [معرب از پهلوی] *اسم.* قارەمان؛ قەرەمان؛ پاڵەوان؛ پەلەوان: ١. کەلەمان؛ قادڤین؛ بەتڵ؛ کۆپەک؛ گورد؛ کەسێ کە لە وەرزش، کێبەرکێ یان شەڕدا سەر دەکەوێ ٢. کەسایەتی سەرەکی و هەرەگرینگی داستان، شانۆنامە یان فیلمنامە.

**قهرمانانه** [1] / qahramānāne, qahremānāne/: [معرب/ فارسی] *صفت.* قارەمانانە؛ پاڵەوانانە؛ وەک پاڵەوانان ‹جنگ قهرمانانە: شەڕی قارەمانانە›.

**قهرمانانه** [2]: *قید.* قارەمانانە؛ پاڵەوانانە؛ بە شێوەی قارەمانان ‹قهرمانانه جنگید: پاڵەوانانە شەڕی کرد›.

**قهرمان‌پرستی** /-qahramānparastî, qahremān ، ـها/: [معرب/ فارسی] *اسم.* قارەمان‌پەرستی؛ هۆگری لەڕادەبەدەر و چاوبڕینی لەتام‌دەرچووی کەسانی ناودار و قارەمانان.

**قهرمان‌پروری** /-qahramānparvarî, qahremān ، ـها/: [معرب/ فارسی] *اسم.* قارەمان‌پەروەری: ١. کار و ڕەوتی بار هێنان و پێگەیاندنی قارەمانان ٢. ڕەوتی سەرنج ڕاکێشانی خەڵک بەرەو قارەمانانی خەیاڵی و ڕاستەقینە و هاندان بۆ لە دوو کەوتنیان.

**قهرمانی** / qahramānî, qahremānî/: [معرب] *اسم.* قارەمانی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی قارەمان بوون ‹مقام قهرمانی: پلەی قارەمانی› ٢. ـها/ کردەوەی تایبەت بە قارەمان ‹در جنگ قهرمانی بسیار کرد: لە شەڕدا زۆری قارەمانی نواند›.

**قهری** / qahrî/: [عربی] *صفت.* ١. ناچاری؛ ناعیلاجی؛ بەرامبەر بە قانون؛ پێویستی یان دلخوازی دیتران ‹قبول قهری: پەزیرانی ناچاری› ٢. قیناوی؛ قین‌لەبەرانە ‹عمل قهری: کاری قیناوی›.

**قهقرا** / qahqarā/: [عربی] *اسم.* ١. دوا؛ دما؛ دوما؛

دوویـا ۲. ڕەوتی هەڵـگەڕانەوە؛ هەڵـوەگەڕان؛ هەڵـەوگەڕیان؛ گەڕانـەوە؛ چوونـەوە؛ ڤەکشـان؛ کشانەوە؛ دواوە چوون؛ هۆرەوەگێلەی؛ گێلایـوە؛ دواوە کشان؛ بەرەو پاش چوون.

**قهقرائی** / qahqarā'î/: [عربی] ☜ **قهقرایی**

**قهقرایی**/ qahqarāyî/: [عربی] *صفت.* کشانەوەیی؛ سەر بە دواوە چوون و کشانەوە: **قهقرائی**

**قهقهه** / qahqahe ، ـها/: [عربی]/*اسم.* قاقا؛ ترەقـە؛ تریقە؛ تریکە؛ قیقە؛ تریقەتریق؛ حیلکـە؛ قیلکـە؛ تریـک و هـۆڕ؛ پریـک و هـۆڕ؛ حیلکـەحیلک؛ تیقەتیق؛ ترقە؛ پرمە؛ لق ـلق؛ هنـگ ـهنـگ؛ هنگـی؛ هیراهـیرە؛ هیرهـیر؛ دەنگـی بـەرز و بڵیندی پێکەنین ‹صدای قهقهەی مهمانـان تـا سر کوچه می‌رسید: دەنگی قاقای میوانـەکان دەگەیشـتە سەری کۆڵانەکە›.

**قهوه** / qahve/: [عربی]/*اسم.* قاوە؛ قـەهوە؛ قەڤـە: ۱. ـ/ها/ داری هەمیشە سەوزی قاوە بـە گـەڵای بەرانبەر و هێلکەئاسا و گوڵی سـپی بۆنخـۆش و میوەی خـڕ و سـفتەوە ۲. تـۆمی میـوەی داری قاوە کە ئالکالوئیدێک بە ناوی کافیئینی تێدایـە دنەدەری دەمارە. برژاوەکەی بە ڕەنگی قاوەییـە و بـۆنێکی خۆشـی هەیـە کـە بـە شـێوەگەلی جۆراوجۆر دەخورێتەوە: **قهوەی تُرک**

◘ **قهوەی ترک** ☜ **قهوه ـ ۲**

**قهوەی فوری**: نسکافە.

**قهـوەای**[1] / qahve'î/: [عربـی]/*اسـم.* قـاوەیی؛ کەمکۆڵی؛ بۆر؛ بوور؛ ڕەنگێک لـە نێـوان زەرد و سووردا.

**قهـوەای**[2]: *صـفت.* قـاوەیی: ۱. بـورجقین؛ بـە ڕەنگی قاوە. هـەروەها: **قهوەای‌رنگ** ۲. قـاوەدار؛ تێکەڵ بە قاوە ‹شیرینی قهوەای: شیرینی قاوەیی›.

◘ **قهوەای روشن**: هیل؛ ڕەنگی قاوەیی کاڵ.

**قهوەای سوخته**: قاوەیی تاڵ؛ قاوەیی تۆخ.

**قهوەجـوش** / qahvecûš ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] /*اسم.* قاوەجۆش؛ دەللە؛ دەفری دەسەدار بۆ قـاوە لێنان.

**قهوەچی** / qahvečî ، ـهـا/: [عربـی/ ترکـی]/*اسـم.* قاوەچی؛ چایچی؛ ئابدار؛ کەسێ کە پیشەی قاوە سازکردنە.

**قهوەخانـه** / qahvexāne ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] /*اسم.* قاوەخانـە؛ قەڤـەخانە؛ چایخانـە؛ چاخانـە؛ شوێنێک بۆ دانیشتن، قسەکردن و چای و قـاوە خواردنەوە (و خواردنی چێشتی سادە).

**قهوەخوری** / qahvexorî ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] /*اسم.* قاوەخۆری؛ پیاڵـەی چکۆڵـەی تایبـەت بـۆ خواردنەوەی قاوە.

**قی** / qey/: [عربی]/*اسم.* [*گفتاری*] ۱. یـەق؛ هـۆق؛ هێـق؛ نشـر؛ هـەراش؛ هـەراژ؛ قـەی؛ قەسـیو؛ قەیپەڕۆشە؛ ڕەوتی هەڵهاوردنەوەی ئـەوەی لـە گەدەدایە ۲. ڕشاوە؛ زێڵەشێوە؛ ئەوەی بەو شێوە دێتەوە ۳. ڕیپۆق؛ گوژاو؛ ڕچقاوە؛ ژەک؛ کلمش؛ کڵـمیش؛ قلـیچ؛ قلمـوویچ؛ پـیخ؛ شـەلق؛ لـچ؛ ڕیخنە؛ ڕیق؛ شلیماق؛ کیلـک؛ تـراوی خەسـتی زەرد کە برێ‌جار بە هۆی چڵـکەوە لـە سیلەی چاو کۆ دەبێتەوە.

◘ **قی کردن**: هێنانەوە؛ هەڵاوردنـەوە؛ ڕشـانەوە؛ وەڕشـین؛ وەڕشـان؛ وەڕشـیان؛ ڤەڕشـان؛ ڤەڕەشان؛ ڤەڕشین؛ ڤەڕشان؛ دڵ ڕابـوون؛ دل رابـین؛ یـەق/ هێـق‌کردنـەوە؛ ڤەریشـان؛ هلوڤیتن؛ هۆرئاردەیوە؛ قەیپـەڕۆش‌کـەردەی؛ نشراندن؛ نشرین؛ قەسیان؛ هەڵگەڕانەوە یـان هەڵگەڕاندنەوەی شتی ناو گەدە بۆ دەرەوە.

**قی‌آور** / qeyāvar, -'āvar/: [عربی/ فارسی] *صفت.* هێڵنجهـاوەر؛ تایبەتمەنـدی شـتێک کـە هـۆی ڕشانەوە بێت.

**قیادت** / qiyādat/: [عربی]/*اسـم.* [*ادبی*] ڕێبـەری؛ سەرکردەیی؛ پێشەوایی؛ ڕێبەرایەتی.

**قیـاس** / qiyās/: [عربـی]/*اسـم.* ۱. کـار و ڕەوتی هەڵسەنگاندنی چەنیەتی یان چۆنیـەتی شـتێک لە هەمبەر شتێکی‌ترەوە ‹این سیب را بـا آن یکـی

قیاس کن: ئەم سێوە لەگەڵ ئەوی‌تردا هەڵسەنگێنە›
٢. ـها؛ ـات/ یەک لە شێوەکانی هۆ هێنانەوەی مەنتیقی لە سەر بنەمای دوو مەسەلەی پێوەندیدار بە یەکەوە (وەک ئەوەی بێژین: بە ڕۆژ تاو هەڵدێ. ئێستا تاو هەڵاتووە. کە وا بوو ئێستا ڕۆژە) ٣. بڕینەوەی بڕیارێک بە پێی بڕیارێکی‌تر بە بۆنەی وێکچوونیان (وەک: بەپێی قانوون کەس ناکرێ بە فرۆشتنی شتێکی خۆی ناچار بکرێ. بە پێی ئەوە بێژین: کەسیش ناکرێ بە سەندی شتێک ناعیلاج بکەین): **قیاس صوری**

▣ **قیاس صوری** ☜ **قیاس ـ ٣**

**قیاس مَع‌الفارِق:** سەنگ و سووکی دوو شت پێکەوە لە حاڵێکدا پێوەندیان پێکەوە نیە (وەک ئەوە پشیلە لەگەڵ ماردا هەڵسەنگێنین).

▣ **قیاس به نفس کردن:** بە پێوانەی خۆ پێوان؛ گوێز لە هەمانەی خۆ بژاردن؛ بار و دۆخی کەسێک بەگوێرەی خۆ لێکدانەوە و بڕیاردان.

**قیاس کردن:** سەنگاندن؛ هەڵسەنگاندن؛ بەراوردکردنی شتێ دەگەڵ شتێکی‌تردا.

**قیاسی** / qiyāsî/: [عربی] *صفت*. پێومانی؛ پێوانەیی.

**قیافتاً** / qiyāfatan/: (!) [عربی] *قید*. بە قەلافەت؛ بە ڕواڵەت؛ بە هێما؛ لە ڕووی بیچم.

**قیافه** / qiyāfe ، ـها/: [عربی] *اسم*. بەچک؛ تووز؛ دیامان؛ نژم؛ مۆر؛ قلغ؛ سیما؛ دیدار؛ بیچم؛ تمتیل؛ قلهـ ؛ مێقن؛ نموود؛ نسر؛ قەلافەت؛ قیافە؛ قەلفەت؛ دیمەن؛ تەشک؛ کسم؛ کەسم؛ کێسم؛ لەس‌پێت؛ سەر و شکڵ؛ شکڵ و شێوازی ڕواڵەتی گیاندارێک (بەتایبەت سەر و سیما).

▣ **قیافه گرفتن:** خۆگرتن؛ بیچم گرتن؛ حاڵەتێکی تایبەت بە ڕوومەت دان ‹حالا که رئیس شده قیافه می‌گیرد: ئێستا کە بۆتە سەرۆک خۆی دەگرێ›.

**از قیافەی کسی خواندن:** *[مجازی]* بە ناو چاوانی کەسێکدا زانین؛ لە نێو چاوانی کەسێک خوێندنەوە؛ بە ڕواڵەتی کەسێک لە شتێک گەیشتن ‹از قیافەاش خواندم که پول ندارد: بە ناو چاوانیدا زانیم پارەی پێ نیە›.

هەروەها: **از قیافەی کسی پیدا بودن**

**قیافه‌شناسی** / qiyāfešenāsî/: [عربی/ فارسی] *اسم*. بەچک‌ناسی؛ سیماناسی؛ ڕواڵەت‌ناسی؛ بیچم‌ناسی.

**قیام** / qiyām ، ـها/: [عربی] *اسم*. ١. *[ادبی]* کار و ڕەوتی هەستانەوە؛ ڕابوون؛ ڕاوەستان؛ هۆرسەی؛ هۆرێستەی ٢. شۆڕش؛ ڕاپەڕین؛ کرداری بە کۆمەڵ بۆ ڕزگاری لە بار و دۆخی ناحەزی کۆمەڵایەتی ٣. سەربزێوی؛ سەرکێشی؛ سەربادانی ڕقاوی لە ویستی فەرمانڕەوا.

▣ **تا قیام قیامت:** *[کنایی]* تا ڕۆژی پەسلان؛ تا دنیا دنیاس؛ تا بڕانەوەی جەهان.

▣ **قیام کردن:** ڕاپەڕین؛ هەڵتەزینەوە.

**قیامت** / qiyāmat/: [عربی] *اسم*. قیامەت؛ حەشر: ١. *[اسلام]* پەسلان؛ پسات؛ قارسی؛ سەڵا؛ ڕۆژی سەلات؛ ڕۆژا پەسلانێ؛ ڕۆژا پاشین؛ ڕۆژی پسات؛ ڕۆژی دوایی هاتنی ئەم دنیایە و پێڕاگەیشتنی خودا بە چاکە و خراپەی خەڵک ٢. ـها/ *[کنایی]* قەرەباڵغی یان سەر لێ‌شێواوی خەڵک ‹امروز در خیابانها قیامت بود: ئەمڕۆ لە شەقامەکاندا حەشر بوو› ٣. ـها/ *[مجازی]* ڕووداوێ کە هۆی سەرسووڕمانی لە ڕادەبەدەری خەڵک بێ ‹هنرپیشەی اوّل فیلم، قیامت کرد: هونەرپیشەی یەکەمی فیلم حەشری کرد›.

▣ **روز قیامت** ☜ **قیامت ـ ١**

**قیام‌وقعود** / qiyām-o-qo'ûd, -qu'ûd/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* هەڵس‌ونیشت؛ هەڵس‌وبنیش؛ هەڵس‌ودانیش؛ هۆرزونیش؛ هۆرس‌وئەرەنیشت؛ کاری هەستان و دانیشتن؛ ڕابوون و ڕۆنیشتن.

**قیچ** / qîč/: [؟] *صفت*. *[گفتاری]* ☜ **لوچ**

▣ **قیچ شدن:** کووڕ بوون؛ گۆج و ڕەق بوونی قامکی دەست و لاق.

**قیچــی** / qeyčî ، ـهـا/: [ترکـی]/اسم. دوێــرد؛ دوێــــردگ؛ دوێـــــرده؛ دۆدی؛ دوارد؛ دواردی؛ دوەردی؛ تۆرتۆ؛ تۆتـۆر؛ مەگریجـەنی؛ مقەسـت؛ مقەس؛ مەقەست؛ قەیچی؛ قاچی؛ ئامرازێـک بـۆ برین بە دوو تێخەی تیژەوە کە بـە سـەر یەکـدا دێن: **مِقراض**

◘ **قیچی کردن**: پاچین؛ قاچین؛ قەیچی کـردن؛ داقوساندن؛ پەرتاوتن بە قەیچی.

**قید** / qeyd/: [عربی]/اسم. ۱. ـ/ها؛ قیود/ بەند؛ وەن؛ گیر؛ دەربەست؛ ئەوەی بەر بە بزووتنەوەی ئازاد و سـەربەخۆ دەگـرێ ۲. کـار و ڕەوتی هێنـانی بابەتێک لە نووسراوەیەکدا ‹این را هـم در نامـهاش قید کرده بود: ئەمەشی لە نامەکەیدا هینابوو› ۳. ـ/ها؛ قیود/ [دستور] ئاولکردار؛ ئاوەڵکار؛ وشەیێ کە کار، ئاوەڵـناو یـان وشـەیەکی‌تـر بـە کـات، جـێ، چۆنیەتی، ئەندازە و شتی واوە دەبەستێتەوە.

◘ **قید استثنا**: ئاوەڵکاری هـاوێر؛ ئاوەڵـکارێ کـە نیشانەی جیا کردنەوەیە (وەک: جگە، مەگەر).

**قیـد استفهام**: ئاوەڵـکاری پـرس/ پرسـیار؛ ئاوەڵکارێ کە نیشانەی پرسـیارە (وەک: کـام، کەی).

**قید تأکید**: ئاوەڵکاری جەخت؛ ئاوەڵکارێ کـە بۆ جەخت‌کردن دێت (وەک: بێ‌شک، ناچار).

**قید ترتیب**: ئاوەڵـکاری نـۆرە؛ ئاوەڵـکارێ کـە نیشانەی چلۆن ڕیـز بوونـە (وەک: لـە پەسـتا، یەک‌بەیەک).

**قید زمان**: ئاوەڵکاری کات؛ ئاوەڵکارێ کە کات نیشان دەدا (وەک: دێر، زوو).

**قید شک**: ئاوەڵـکاری شـک؛ ئاوەڵـکارێ کـە نیشانەی دڵنیا نەبوونە (وەک: ڕەنگە، مەگەر).

**قید مکان**: ئاوەڵـکاری شـۆن؛ ئاوەڵـکارێ کـە شـۆن نیشـان دەدا (وەک: بـەرەو سـەر، بـۆ دەرەوە).

**قید نفی**: ئاوەڵـکاری نـەرێ؛ ئاوەڵـکارێ کـە نیشانەی نەرێ‌کردن و ڕەت‌کردنەوەیە (وەک: هیچ، هەرگیز، قەت).

**قید وصـف**: ئاوەڵـکاری دۆخ؛ ئاوەڵـکارێ کـە دۆخی کردارێک نیشان دەدا (وەک: ئاشکرا، بە گریان).

◘ **قید چیزی را زدن**: لە شـتێک چـاو پۆشـین؛ خێری شتێک بەخشینەوە؛ بە نابەدڵی واز لـە شـتێ هێنـان؛ دەسـبەرداری شـتێک بـوون؛ دەست لە شتێک هەڵگرتن.

**قید شدن**: نووسـران؛ هـاتن؛ ئامـاژە پێکـران. هەروەها: **قید کردن**

**در قید چیزی بودن**: لە بەندی شتێکدا بـوون؛ بیر لە شـتێک‌کردنـەوە؛ دەربەسـتی شـتێک بوون؛ بە شوێن مەبەستێکەوە بوون.

**قیدوبنـد** / qeyd-o-band ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] /اسم. گـیرداو؛ گـیر و داو؛ ئـەوەی ببێتـە هـۆی بەرگری و تەنگەبەری.

**قیدوشرط** / qeyd-o-šart ، ـها/: [عربی]/اسم. بەند و بەست؛ بەن و بەس.

**قیر** / qîr/: [معرب از یونانی]/اسم. قیر؛ قـیرە؛ قیـل؛ ماکێکی ڕەشی نیوەتراو لە هیدرۆکەربون کە لـە گەرمادا تەواو دەتوێتـەوە و لـە پـالاوتنی نـەوت بەرهەم دێ.

**قیراط** / qîrāt ، ـها/: [معرب از یونانی]/اسم. قـیرات؛ دوو لە دەی گرەمێک؛ یەکەی کێش بۆ کێشانی بەردی گرانبایی بەرانبەر بە ۰,۲ گرەم.

**قیراطی** / qîrātî/: [معرب از یونانی]قید. زۆر کـەم؛ تۆسقاڵێ؛ تۆزقاڵێ؛ تۆزێک؛ گولالەیەک.

**قیراندود** / qirandûd ، ـها/: [معرب/ فارسی] صفت. قیرتاو؛ قیرەتاو؛ قیـل‌تـاو؛ قیرنـاو؛ داپۆشـراو بـە تۆزێک قیر.

**قیروگونی** / qîr-o-gûnî/: [معرب/ هنـدی]/اسم. قیر وگوونی؛ قیرەگۆنی؛ کەرەستەیەک بریتی لە گۆنی لە قیردا گەوزاو بۆ پاراستنی خانووبەرە لە نم و تەڕایی.

**قیـری** / qîrî/: [معـرب] صفت. قـیری؛ قـیراوی؛

قیلاوی؛ له قیل گەوزاو.

**قیسی** / qeysî ، ـها/:اسم. قەیسی: ۱. جۆرێ شێلانەی بۆنخۆش و شیرن ۲. شێلانەی لەتکراو و وشکەوبووگ ۳. هەشتالووکوت ٤. شێلانەی وشکەوبوو کە بە ناوکە بادام یان ناوکە شێلانە پڕکراوەتەوە.

**قیش** / qeyeš ، ـها/: [ترکی]/اسم. ۱. قەیش؛ قایش؛ بەندی چەرمی ۲. سیرم؛ سیرمە؛ دواڵ؛ دور؛ زۆڵ؛ زوێڵ.

**قیصر** / qeysar ، ـها/: [معرب از یونانی]/اسم. قەیسەر؛ نازناوی کەونارای برێ لە میرمەزنانی ئورووپا، بەتایبەت پاشای رۆم.

**قیطان** / qeytān ، ـها/: [معرب از فارسی]/اسم. قەیتان؛ قەیتانە؛ شەهبەن؛ بەنۆک؛ پەتک؛ هەودای ناسک و باریکی هۆنراو لە ڕیشاڵە بەتایبەت هاورێشم.

**قیطاندوزی** / qeytāndûzî ، ـها/: [معرب/ فارسی] /اسم. قەیتاندووری؛ شێوازێکی گولدووری بە دەرزی و نەواری ڕەنگاوڕەنگ و قەیتان و پوولەکە و زەنگیانەوە کە لە سەر دەسرە و دەسماڵی دەدروون.

**قیطانی** / qeytānî/: [معرب] صفت. قەیتانی: ۱. لە جنسی قەیتان ۲. باریک وەک قەیتان ‹ابروی قیطانی: برۆی قەیتانی›.

**قیطس** / qeytos/: [معرب از یونانی]/اسم. [نجوم] نەهەنگ؛ نەققە؛ نەقە؛ وێنەیەکی ئاسمانی باشووری.

**قیف** / qîf ، ـها/:اسم. کۆڤک؛ کوفک؛ ڕاحەتی؛ ڕەحەتی؛ ڕەحاتی؛ بەتوو؛ ماستەرگ؛ ماستێر؛ سەرتلک؛ سەرتلیک؛ ئامرازێکی زار هەراوی بن تەنگە، تراوی پێ لە دەفری زار تەنگ (وەک بوتری) دەکەن.

**قیفاوس** / qîfāvos/: [معرب از یونانی]/اسم. [نجوم] قیفاوس؛ کۆمەڵە ئەستێرەی ئاسمانی باکووری کە لە ۳۵ ئەستێرە پێکهاتووە و لە چاو بینەری سەر زەوی، سەری لە کۆئەستێرەی ڕێی شیری و پای چەپی لە جەمسەری باکووردایە.

**قیفی** / qîfî/: صفت. قیفی؛ ماستەرگی؛ سەرتلکی؛ وێنەی ڕەحەتی.

**قیقاج** / qeyqāc/: [ترکی] صفت. [گفتاری] بەرەولا؛ قیچەلقاچ؛ قیچەلفاچ؛ قیلەقاچ؛ قیلەوقاچ؛ قیرقاچ؛ قیروقاچ؛ لاترقەوچ؛ لاترقەوچە؛ لاترقەوچەلفاچ؛ خواربردراو؛ خوارەخوار؛ چەفتوور؛ چەفتوول؛ شەفتوور؛ دۆلکان؛ تیلاوتیل؛ کەش ــ تووش؛ یەوکشت؛ خوار و خێچ.

**قیل‌وقال** / qîl-o-qāl ، ـها/: [عربی]/اسم. قالەقاڵ؛ قیلەقیل؛ هەرا و مەزات؛ هەرەمەزات؛ هەرا و هوریا؛ قیژەقیژ؛ قاوقیژ؛ هەللا-هەللا؛ هەرا-هەرا؛ داکۆکە؛ زەنازەنا؛ دەنگ و هەرا.

**قیلوله** / qeylûle/: [عربی]/اسم. قەیلوولە؛ خەوی پێش نیوەڕۆ.

**قیلی‌ویلی** / qîlîvîlî/:اسم. [گفتاری] تلی‌لیلی؛ قلەللی؛ زیچ؛ هەستی کەیفخۆشی و بەختەوەری.

▣ قیلی‌ویلی رفتن: تلی‌لیلی بوونەوە؛ لە خۆشیان هۆش لێ‌بران؛ لە خۆشیان فل و سست بوونەوە.

**قیم** / qayyem ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. کارتیک؛ سەروەگرد؛ سەر وەسیەت؛ قەویت؛ کەسێ کە پاش مردوو بە سەر ماڵ و منداڵیدا ڕادەگا ۲. داڵیت؛ داڵووت؛ چەوتەک؛ لقە دار یان پێکهاتەیەک کە شەتڵ و نەمام یان ڕوەکی لق نەرمی پێوە ڕادەگرن.

**قیماق** / qeymāq/: [ترکی]/اسم. تۆ؛ توێ؛ تۆژی؛ تۆژگ؛ سەرشیر؛ سەرتۆ؛ سەرتوێ.

**قیمت** / qeymat, qîmat ، ـها/: [عربی]/اسم. نرخ؛ بایی؛ بەها؛ هێژ؛ قیمەت.

▣ قیمت اسمی: نرخی سەرەتایی و بە گوترەی شتێک.

**قیمت پایه**: نرخی بنەڕەتی؛ نرخی کاڵی شتومەک بێبژاردنی مەزاخت و داشکانە.
**قیمت تمام‌شده**: نرخی تەواوبوو؛ نرخی شتومەک بە بژاردنی مەزاختەکانی (وەک ڕاگواستنەوە، هەڵگرتن، بەستەبەنی و ...).
**قیمت خرید**: نرخی کڕین: ۱. پارەیەک کە فرۆشیار داویە ۲. نرخێ کە سەنیار دەیدا.
**قیمت روز**: نرخی ڕۆژ؛ نرخی کاڵا لە ڕۆژی سەوداداٰ.
**قیمت عادله**: نرخی ڕاستەقینەی شتێ کە نەبێتە هۆی زیانی کڕیار و فرۆشیار.
**قیمت فروش**: نرخی فرۆش؛ نرخێ کە فرۆشیار بۆ کاڵاکەی دایدەنێ.
▣ **قیمت دادن**: نرخ دانان: ۱. بۆ کاڵایەک نرخێک پێشنیارکردن ۲. *[مجازی]* بایەخ پێدان؛ نرخ پێدان ‹باید به این نوع کارها قیمت داد تا تشویق بشوند: دەبێ بایەخ بەم کارانە بدرێ تا دڵگەرم بن›.
**قیمت را بالا بردن**: نرخ هەڵکێشان/ بردنە سەرەوە؛ نرخ بۆ شتێک زۆرتر لەوەی کە هەیە دانان.
**قیمت زدن**: نرخ لێدان؛ نووسینی نرخ لە سەر کاڵا.
**قیمت شکستن**: ۱. هەرزان بوون ۲. نرخ شکاندن؛ نرخی کاڵایەک هەرزانترکردن.
**قیمت کردن**: بایی‌کردن؛ نرخ دەرهێنان؛ کردنە قیمەت؛ بایی شتێک پرسین ‹یک پیراهن قیمت کردم بیست هزار تومان: کراسێکم بایی کرد بە بیست هزار تمەن›.
**قیمت گذاشتن**: نرخ دانان؛ قەبلاندن؛ نرخ بڕینەوە؛ دیاری‌کردنی نرخی شتێک.
**از قیمت افتادن**: لە نرخ کەوتن؛ کەم‌بایەخ بوون؛ قیمەت هاتنە خوارەوە.
**قیمت‌شکنی** / qeymatšekanî, qîmat- ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. نرخ‌شکێنی؛ ڕانانی کاڵا بە زۆری و هەرزانی بۆ شکاندنی نرخی.
**قیمت‌گذاری** / qeymatgozārî. qîmat- ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. کار و ڕەوتی نرخ دانان؛ دیاری کردنی نرخی فرۆشی کاڵا ‹قیمت‌گذاری مسکن: نرخ دانانی خانووبەرە›.
**قیمتی** / qeymatî ، ـها/: [عربی] *صفت*. بەنرخ؛ گرانبایی؛ قیمەتدار؛ بایەخدار؛ گران؛ پڕبایی ‹این فرش خیلی قیمتی است: ئەم قاڵیە زۆر بەنرخە›.
**قیمومت** / qeymûmat/: [عربی]/اسم. ۱. سەرپەرشتی؛ کارتیکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرپەرشت بوون ۲. /ـها/ سەرپەرستی کەسێکی منداڵ یان دواکەوتوو بە بڕیاری دادگا ۳. کار یان ڕەوتی هەڵسووڕاندنی کار و باری وڵاتێک بە هۆی بڕیارنامەی نێونەتەوەیی لە لایەن وڵاتێکی ترەوە کە دەستی بەسەرداگرتووە ✱ **قیمومیّت**
**قیمومیت** / qeymûmîyyat/: [عربی] ☜ **قیمومت**
**قیمه** / qeyme, qîme/: [ترکی]/اسم. قیمە: ۱. پەل؛ گۆشتی ئەنجندراو ۲. خۆرشتێک لە پەلەگۆشت، سێفەزەمینە، نخوەشەر، ڕبی تەماتە و ڕۆن.
**قیمەبادنجان** / qeymebādemcān, qîmebādencān/: [ترکی/ فارسی]/اسم. بۆرانی باینجان؛ خۆرشتی قیمە کە لە جێی سێفەزەمینی، باینجان و تەماتەی تێدەکەن.
**قیمه‌پلو** / qeymepolow, qîmepolo/: [ترکی/ فارسی]/اسم. قیمەپلاو؛ جۆرێ پلاوی بە نخۆشەر و قیمە و سێفەزەمینی سوورەوەکراو و پیوازەوە لێنراو.
**قیمه ــ قیمه** / qeyme-qeyme, qîme-qîme/: [ترکی] *صفت*. ڕیز ـ ڕیز؛ ڕێزە ـ ڕێزە؛ ورد ـ ورد؛ ئەنجن ـ ئەنجن؛ هەنجن ـ هەنجن.
**قیود** / qoyûd, quyûd/: [عربی] جمعِ ☜ **قِید**
**قیه** / qîyye/ ☜ **غیه**

# ک

**کَ / k/:** حرف. ک؛ نیشانەی بیستوپێنجەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**کَ/ ke/:** اسم. کێ؛ کاف؛ ناوی بیستوپێنجەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**ـکَ / ak/:** پسوند. ١. ـیژگە؛ ـ ۆلە؛ ـیژە؛ ـیجە؛ ـێچکە؛ ـیکلانە؛ ـێلە؛ ـیکلە؛ ـیلکە؛ ـیلە؛ ـەکلە؛ ـکلە؛ ـ لە؛ ـ لە؛ ـەلە؛ ـل؛ ـلێ؛ ـلەک؛ ـۆلکە؛ ـ وولکە؛ ـەلانە؛ ـوولە؛ ـ وولە؛ ـولە؛ ـۆکە؛ ـۆک؛ ـوکە؛ ـ ۆل؛ ـەکە؛ ـ ووچکە؛ ـ ۆچکە؛ ـ ووک؛ ـ لۆکە؛ ـ وچکە؛ ـ وک؛ ـ وکە؛ ـ وسکە؛ ـک؛ ـکۆک؛ ـکۆ؛ ـکە؛ ـکەلە؛ ـکەلانە؛ ـلۆکە؛ ـ لۆکە؛ ـەلە؛ پاشگری نیشانەی گچکە بوون ‹پسرک؛ دخترک؛ کورێژگە؛ کچۆلە› ٢. ـۆکە؛ ـ یلە؛ ـ یلانە؛ ـەلانە؛ ـ ۆلە؛ ـ یکلانە؛ ـ یلان؛ ـک؛ ـکێ؛ ـکۆلێ؛ ـ لە؛ ـەکە؛ ـەکێ؛ ـ یلێ؛ ـەلە؛ ـ ۆل؛ ـ ۆلێ؛ ـ لێ؛ ـەلێ؛ ـەل؛ ـ کەلە؛ ـ کەلانە؛ ـ لیلە؛ ـ لیلێ؛ ـەلە؛ ـەلانە؛ نیشانەی دۆستی و دلۆڤانی ‹طفلک؛ عزیزک؛ مندالوکە؛ نازیلی› ٣. ـ ۆکە؛ ـ لە؛ ـ وکە؛ ـ ێلە؛ ـ ۆل؛ ـەلە؛ ـەک؛ نیشانەی سووکایەتی ‹شاعرک؛ شاعیرۆکە› ٤. ـۆکە؛ ـیر؛ ـال؛ ـەک؛ بۆرە ـ ؛ نیشانەی کەم بوون یان ئەوتۆ نەبوون ‹کَمَک؛ کەمۆکە› ٥. ـک؛ ـە؛ ـەک؛ ـ ێ؛ ـ ینە؛ ـکە؛ نیشانەی ناوی ئامراز ‹کارد؛ کارتەک› (لە کوردیدا وەک: بڕەک، نووسەک، ڕنەک، هێلەک) ٦. ـەک؛ ـەلووکە؛ ـەلەک؛ ـەلۆک؛ ـ ۆکە؛ ـەک؛ ناوی کار یان حالەت ‹پُشتک؛ پشتەک› (لە کوردیدا وەک بەستەلەک، بەستەلوک) ٧. ـەک؛ ـیجە؛ ـ یژە؛ ـ ێچکە؛ ـ لە؛ ـ یلێ؛ ـان؛ ـە؛ ـ ێلە؛ ـ لێ؛ ـەک؛ ـ ێژە؛ ـ ێژکە؛ ـە؛ ـ ێجە؛ ـ یک؛ ـ یکە؛ ـ ێکە؛ لە ئاوەڵناو ناو پێک دێنێ ‹گرمک؛ سرخک؛ گەرمەک؛ سووریجە› ٨. ـەکە؛ ـە؛ ـەکێ؛ ـکە؛ ـەکێ؛ نیشانەی بناس کردنی ناو ‹مردک آمد، شما نبودید: زەلامەکە هات، ئێوە نەبوون› ٩. ـەلە؛ ـ لە؛ ـە؛ ـ لێ؛ ـ لێ؛ ـکەلە؛ ـ کەلە؛ لە ناو، ناوێک بە واتایەکی نوێ پێک دێنێ و نیشانەی لێچوونی تێدایە ‹عروسک؛ بووکەلە›.

**کائنات / kā'enāt/:** [عربی] ☜ کاینات

**کائوچو / kā'uču/:** [فرانسوی] اسم. کائۆچۆ؛ کاوچوو: ١. ماکێکی جیرە کە لە گرسانی شیلەی بڕێ گیای گەرمیان (وەک هیوئا و فیلکووس) بەرهەم دێ، پەڕە ـ پەڕەی دەکەنەوە و لە زۆر کاری پیشەسازیدا بە کاری دەبەن ٢. هەر کام لە ماکگەلی جۆراوجۆری دەسکردی لاستیکئاسا.

**کائوچوئی / kā'uču'ī/:** [فرانسوی] ☜ کائوچویی

**کائوچویی / kā'učuyî/:** [فرانسوی] صفت.

کائۆچۆیی؛ کاوچوویی؛ لە جنسی کـائۆچۆ ‹تـوپ کائوچویی: تۆپی کاوچۆیی›: **کائوچوئی**

**کـائولن / kā'olan/:** [فرانسـوی]/اسم. کـائولێن؛ خاکی چینی؛ خـاکی سـپی؛ خـاکێکی مەیلـەو سپی و ئاوکێشە، بۆ دروستکردنی چینی بە کار دێ و دەرمانی زگ چوونە: **کائولین**

**کائولین / kā'olîn/:** [انگلیسی] ☜ **کائولن**

**کابـاره / kābāre، ـها/:** [فرانسـوی]/اسم. کابـارە؛ مەیخانەیەک بە هەموو جۆرە بەزم و هەڵـپەڕکێ و ئاوازەوە بۆ ڕابواردنی مشتەریان.

**کابل / kābl، ـها/:** [فرانسوی]/اسم. کابل؛ ڕشـتەی سیمی بادراو و ڕووکێش‌کـراو بـۆ گواسـتنەوەی هێزی کارەبا و... ‹کابـل بـرق: کابـل تلفـن: کـابلی کارەبا؛ کابلی تەلەفوون›.

■ **کابل نوری:** کـابلی نـووری؛ دەسـتەیەک لـە هەوداگەلی نووری کە وەک کابل بادراون.

**کابل کشی / kāblkešî/:** [فرانسـوی/ فارسـی]/اسم. کابل‌کێشی؛ کار و ڕەوتی دانان و دە کـارکردنی کابل لە جێگایەکدا ‹کابل کشی برق: کابـل کێشـی کارەبا›.

**کابوئی / kābo'î/:** [انگلیسی] ☜ **کابویی**

**کابوس / kābûs، ـها/:** [عربی]/اسم. ۱. ئارختـک؛ مۆتەکە؛ مۆتە؛ دێوەزمە؛ دێوەزمۆکە؛ مێردەزمـە؛ کاوس؛ کـامووس؛ کامووسـک؛ کـابووس؛ خێـو؛ ئاڵەشەوە؛ دیمەن یان بوونەوەری بە هەیبـەت و خۆفناک کە بە هۆی ترسی زۆر یان نەخۆشیەوە دێتە بـەرچاو ۲. شـەوە؛ شەڤـە؛ شـەڤ‌پەسـت؛ خەفتوو؛ خەفچ؛ بەرخـەفچ؛ خـەفتوو؛ ئارختـک؛ مۆتەکە؛ مۆتـە؛ سـرنجک؛ سۆکاچە؛ کـامووس؛ کامووسـک؛ خـەوناگران؛ خـەوی خۆفنـاک کـە ببێتە هۆی ترس، هەست بە خنکان و لـە خـەو ڕاچڵەکان ۳. [مجازی] وەیشوومە؛ نەنگواز؛ دۆخی زۆر سەخڵەت و ناخۆش.

**کابوک / kābûk/:** [کردی]/اسم. کابۆک؛ کابووک؛ کەڤۆک؛ کافۆک؛ کاپۆک: ۱. هێلانە؛ لانە؛ لیانی؛ لانی باڵندە ۲. زەمبیلێ کە دە ماڵدا دارەڵۆزیان دەکرد هەتا کۆتران خای تێکەن.

**کابوی / kāboy، ـها/:** [انگلیسـی]/اسم. کـابۆی؛ گاوانی ئەمریکی.

**کـابویی / kāboyî/:** [انگلیسـی] صفت. کـابۆیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کابۆیـەوە ‹کـلاه کـابویی: کلاوی کابۆیی›: **کابوئی**

**کابین / kābîn/:**/اسم. ۱. مـارەیی؛ مـارە؛ مـەهر؛ کاوین؛ پارە یان ماڵێ کە شوو لە کاتی زەماوەند یان دواتـر بـە هاوسـەری دەدا یـان بـڕیار دەدا بیداتێ ۲. /ـها/ [فرانسوی] کـابین؛ هـۆدە؛ وەک: *الف)* ژووری گەمیەوان یان مسافر لـە کەشـتیدا *ب)* ژووری فڕۆکــەوان لــە فڕۆکــەدا ج) ژووری تەلەفوون لە تەلەفوونخانە یان لە سەر شەقامدا.

**کابینت / kābînet، ـها/:** [فرانسوی]/اسم. کابینێت؛ دوڵاوچە؛ قەفەسەی بە نهۆم و درگاوە بەتایبەت لە ئاشپەزخانەدا.

**کابینه / kābîne، ـهـا/:** [فرانسـوی]/اسم. کابینـە: ۱. کۆڕی وەزیران ‹دیشب جلسـەی کابینـە تشکیل نشد: دوێشـەو دانیشـتنی کابینـە بـە ڕێـوە نـەچوو› ۲. [قدیمی] دەفتەری وەزیر.

**کاپ / kāp، ـها/:** [انگلیسی]/اسم. کـاپ: ۱. جـام؛ گوڵدانێکی دەستەداری کانزاییە لـە کێبـەرکێی وەرزشـیدا وەکـوو خـەڵات، بـە سـەرکەوتوانی دەدەن ۲. چارۆک؛ چارۆکە؛ چارەکـە؛ چارەگـە؛ چاریک؛ کۆڵوانە؛ پۆشەنێکە ژنان بە سەر شـانیدا دەدەن.

**کاپشن / kāpšen, kāpšan، ـها/:** [از فرانسوی]/اسم. کاپشین؛ کاپشەن؛ قەمسەلـە؛ جلێکـی کـلاودار یان بێ‌کلاوە لە سەرمادا بە سەر کۆتـدا یـان لـە جێ کۆت لە بەری دەکەن و بەرەوەی بە قوپچە یان زیپ دەبەسترێ.

**کـاپوت / kāpût، ـهـا/:** [روسـی]/اسم. کـاپووت: ۱. دەرگا یان پۆشـەنی سـەر موتـوری ماشـێن ۲. دەرکــی ســندووقی پشــتەوەی ماشــین

۳. پۆشـەنێکی زۆر ناسـکی پەلاسـتیکیە، کـاتی نزیکی ژن و پیاو، بۆ پێشگری لـە منداڵ بـوون یان نەخۆشی، بە سەر شەرمی پیـاودا دەکـرێ: **کاندوم**

**کــــاپوچینو** / kāpočîno/: [ایتالیـــایی]/ا*ســـم*. کاپۆچینۆ؛ تێکەڵی قاوە و کاکاهوو کە لە شـیری داخی دەکەن و بە شەکرەوە دەیخۆن.

**کاپوشین** / kāpûšîn ، ـها/: [؟]/ا*سم*. کاپۆشـین؛ چەشنێ مەیموونی ئامریکایی کە کوڵکی تەپڵی سەری لە باشلوقی ڕاهیبەکان دەکا.

**کاپیتالیســـت** / kāpîtālîst/: [فرانســـوی] *صـفت*. کاپیتالیسـت: ۱. /ـهـا/ سـەرمایەدار؛ بـوودە؛ دەولەمەند ۲. /ـها/ هۆگری سەرمایەداری ۳. بـە سیستەمی سەرمایەداریەوە.

**کاپیتالیســـتی** / kāpîtālîstî/: [فرانسـوی] *صـفت*. کاپیتالیستی؛ سەر بە سەرمایەداری.

**کاپیتالیســـم** / kāpîtālîsm/: [فرانســـوی]/ا*ســـم*. کاپیتالیسم؛ سەرمایەداری.

**کاپیتــــان** / kāpîtān ، ـهــا/: [فرانســـوی]/ا*ســـم*. ۱. فڕۆکەوان؛ فڕۆکڤان؛ فڕۆکەئاژۆ؛ خەلەبان؛ ئەو کەسە ئاژۆتنی فڕۆکەی بە ئەسـتۆیە ‹کاپیتـان بـا شما صحبت می‌کند: فڕۆکەوان قسەتان دەگەڵ دەکا› ۲. کەشتیوان؛ گەمیەوان؛ پاپۆڕوان ۳. سەرمەزد؛ کاپیتان؛ ڕێبەری تیمی وەرزشی * **کاپیتن**

**کاپیتن** / kāpîten/: [فرانسوی] ☞ **کاپیتان**

**کاپیتولاســـیون** / kāpîtolās(i)yon/: [فرانســـوی] /ا*سم*. کاپیتولاسیون؛ مـافی قونسـوولی ولاتێکـی بیانی بۆ داوەری و حوکم لەمەڕ شەڕ و کێشـەی هاوولاتانیان لە ولاتێکدا.

**کاتـــالان** / kātālān/: [لاتینـی]/ا*سم*. کاتـالان: ۱. /ـها/ هەر یەکە لە کەسانی خەڵکی کاتالۆنیـا یان مندالانیان ۲. لە زمانگەلی ڕۆمیایی بـاو لـە کاتالۆنیا و بەشگەلی‌تری سپانیادا.

**کاتالـــگ** / kātālog ، ـهـا/: [فرانســـوی]/ا*ســـم*. کاتـالۆگ: ۱. دەفتــەری نیشـاندان و ناسـاندنی بەرهەم و پیتەواگەلی ڕێخراوەیـەک ۲. پـەڕاوی ڕێنمـای دەسـهاتی پیشـەیی ‹این چـرخ خیـاطی کاتالگ ندارد؟: ئەم چەرخی دروومانە کاتالوگی نیە؟›
* **کاتالوگ؛ کالانما**

**کاتالوگ** / kātālog/: [فرانسوی] ☞ **کاتالگ**

**کاتب** / kāteb ، ـها؛ ـان؛ ـین؛ کُتّاب/: [عربـی]/ا*سم*. [*قـدیمی*] نووسەر؛ نڤیسیار؛ نڤیسکار؛ ئـەوەی کـە شتێکی دەنووسی یان وتارێکی تۆمار دەکرد.

**کـــاتر** / kāter ، ـهـا/: [انگلیسـی]/ا*سم*. کـاتیر: ۱. تیژبڕ؛ ئـامێری بـڕینی مووکیـت و شـتگەلی سفت و سەخت ۲. ماشینی بڕینی دەسـتی، بـۆ بڕینی دەستەیەک کاغەز، مقەبا و...

**کات کبود** / kātekabûd/: ا*سم*. [*شیمی*] ژەنگـاڵ؛ لەپکە؛ زاخی شـین؛ مـووروە شـینە؛ مـوورووی شین؛ سوولفاتی مسی ئاودار کە بۆ ئاوکاری مس و لە ناو بردنی مێملی گیا بە کار دێ.

**کـــاتگوت** / kātgot, kātgût/: [انگلیسـی]/ا*ســم*. [*پزشکی*] بەنی بەخیە؛ بەنی تەقەڵی برینکاری کە زۆرتر لە ژێی مەڕ و بزن دروستی دەکەن.

**کـــاتورەای** / kātûre'î/: *صـفت*. ۱. هەڵـکەوت؛ هــاتوبــاتی؛ هــاکۆ؛ بەختانــە؛ بەختــەکی؛ ئەلابەختەکی؛ خۆ و بەختی.

**کاتولیســـیســـم** / kātolîsîsm/: [فرانســوی]/ا*ســم*. کاتولیسیسم؛ ڕێبازی کاتولیک.

**کاتولیـــک**[1] / kātolîk ، ـهــا/: [فرانســوی]/ا*ســم*. کاتولیک: ۱. یەکێک لە لقە گـەورەکانی دیـنی مەسیح کە شوێنگری پاپ و دەوڵەتی واتیکـانن ۲. هــەر یەکــە لــە شــوێنکەوتوانی مەزهــەبی کاتولیک.

**کاتولیـــک**[2]: *صـفت*. کاتولیــک؛ کــاتولیکی؛ پێوەندیـدار بـە کاتولیسیســمەوە ‹نویسـندگان کاتولیک: نووسەرانی کاتولیک›.

**کاتولیکی** / kātolîkî/: [فرانسوی] صفت. کاتولیکی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کاتولیسیسمەوە.

**کــاج** / kāc ، ـهـا/: ا*سم*. ۱. کـاج؛ کـاژ؛ کـاژی؛

دارێکی هەمیشە سەوزی یەکپایەیە بە ساقەتەی بەرز و گرۆڤەر، لق‌وپۆی دوای ساقەتە و گەڵای دەرزی‌ئاسای جووت‌ـجووتەوە ۲. *[قدیمی]* چەک؛ زللە؛ شاپ؛ کەشیدێ؛ شرن؛ سهنتی؛ دەخش؛ شەپلاخە؛ چەپلاخە.

**کاجستان** / kācestān ، ـها/: *اسم.* کاژاو؛ کاژاوی؛ دارستانی کاژ.

**کاجیره** / kācîre/ ☜ گل رنگ ـ۱، **گل**

**کاچی** / kāčî/: *اسم.* چرخیس؛ چرخوویس؛ خارز؛ سایله؛ سەیلێ؛ میوانی؛ میڤانی؛ قەیماخ؛ ئارخاڤک؛ چێشتی هێندێک تەڕی ئارد و ڕۆن.

▣ **کاچی بهتر از هیچی**: لە هیچ باشتر/ خاستر ‹هرچه داد، بگیر! کاچی بهتر از هیچی: هەرچێکی دا، وەریگرە! لە هیچ باشترە›.

**کاخ** / kāx ، ـها/: *اسم.* کۆشک؛ کاخ؛ کاخە؛ قەسر؛ قەسرە؛ بینایەکی گەورە بە ژووری زۆر و ڕواڵەتی جوانەوە بەتایبەت: *الف)* جێگای دانیشتنی شا یان سەرۆک‌کۆمار *ب)* یانەی گەورەی دەوڵەتی یان هەمووانی ‹کاخ دادگستری: کۆشکی داد›

**کاخداری** / kāxdārî/: *اسم.* کۆشکداری؛ کاخداری؛ کاری هەڵپەرتاوتنی کۆشک لە باری خاوێنکاری و هەموو جۆرە پێداویستیەکیەوە.

**کاخ‌نشین** / kāxnešîn ، ـها؛ ـان/: *صفت.* ۱. کۆشک‌نشین؛ کاخ‌نشین؛ دانیشتووی کۆشک و قەلا ۲. *[کنایی]* بە سامان؛ دەوڵەمەند؛ دەوڵەمەن؛ بوودە؛ زەنگین.

**کادانس** / kādāns ، ـها/: [فرانسوی] *اسم. [موسیقی]* کادانس؛ پاژێک لە بڕانەوەی بەشێکی مووسیقاییدا کە چەند جار دووپاتە دەبێتەوە و بە جێی لە پڕ تەواو بوون، هەستی دوایی هاتن بە بیسەر دەدا.

**کادر** / kādr ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* کادر: ۱. چوارچێوە؛ بیچمێکی هەندسی یان تەوزێنی کە بۆ جوانی یان دیار و بەرچاو بوون دەورانـدەوری نووسراوە یان وێنەیەکی پێ گیراوە ‹آگهی ختمش داخل کادر سیاه چاپ شده بود: ئاگەداری سەرەخۆشیەکەی لە کادرێکی ڕەشدا چاپ کرابوو› ۲. ئەندام؛ کەسێکی ڕاهاتوو یان بە لێزانی پێویستەوە بۆ کار لە ڕێخراوەیەکدا ‹کادر حزبی؛ کادر سیاسی: کادری حیزبی؛ ئەندامی سیاسی› ۳. *[عکاسی]* هەرکام لە وێنەگەلی فیلمێک ٤. *[مجازی]* چواردەور؛ چوارچێوە؛ کەوشەن.

▣ **کادر آموزشی**: کادری ڕاهێنان؛ ئەندامی فێرکاری؛ سەرجەمی کەسانێک کە لە دامەزراوە یان ڕێخراوەیەکدا کاری بار هێنان و فێرکردنیان وەئەستۆیە. هەروەها: **کادر اداری؛ کادر درمانی؛ کادر قضایی**

**کادمیم** / kādmiyom/: [فرانسوی]/*اسم.* کادمیۆم؛ توخمی کیمیاوی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٤٨ و کێشی ئەتومی ١١٢,٤٠ بە ڕەنگی سپی مەیلەو ئاوی، زۆر ژەهری، چەکوچخۆر، کە لە ئاوکاری کانزادا کەڵکی لێ‌دەگرن.

**کادو** / kādo ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* دیاری؛ پێشکەشی؛ پێشکێشی؛ کادۆ؛ بەراڤێرک (دیاری جێژن)؛ پەڕوو؛ پۆیلە؛ پۆیلانە (دیاری زەماوەند)؛ ئەوی بە هۆی ڕووداوێک یان بەرانبەر بە دابی کۆمەڵگا بە کەسێک دەدرێ ‹کادوی تولد؛ کادوی عروسی: دیاری لە دایک بوون؛ پۆیلەی زەماوەند›. هەروەها: **کادو آوردن؛ کادو دادن؛ کادو گرفتن**

**کادوپیچ** / kādopîč/: [فرانسوی/ فارسی] *صفت.* ڕیت؛ بەستەبەندی‌کراو بۆ دیاری.

▣ **کادوپیچ کردن**: ڕیت‌کرن؛ بەستەبەندی‌کردن بە شێوەیەکی ڕازاوە (بە قاقەزی ڕەنگی و قەیتان و...).

**کادوئی** / kādo'î/: [فرانسوی] ☜ **کادویی**

**کادویی** / kādoyî/: [فرانسوی] *صفت.* دیاری؛ کادۆیی: ۱. شیاوی دیاری دان بە کەسێک ‹سر کوچه‌مان یک مغازه هست که جنسهای کادویی می‌فروشد: لە سەر کۆڵانی ئێمەدا دووکانێک هەیە

پیتەوای دیاری دەفرۆشیٚ› ٢. پیٚشکەشی؛ دیاری لای کەسیٚک ‹این دستبند شادوبی است: ئەم دەسبەندە دیاریە› ❁ کادوئی

کاذب / kāzeb/: [عربی] صفت. [ادبی] درۆیینە؛ درۆیین؛ درۆیی؛ هەڵبەستراو؛ ناڕاست؛ بە درۆ ‹دلسوزی کاذب: دڵسۆزی درۆیینە›.

کار[1] / kār ، ـها/: اسم کار: ١. فرمان؛ گورە؛ گوروە؛ هەر چەشنە چالاکیەکی سروشتی یان میکانیکی ‹کار ماشین کمباین خوب بود: کاری ماشیٚنی درونەکە باش بوو› ٢. پیشە؛ ئیش؛ کاربەند؛ چالاکی ڕۆژانە و سەرەکی ‹کارش قضاوت است: پیشەی داوەرییە› ٣. هەرمانە؛ هەرمان؛ خەبات؛ ئیش؛ چالاکی ویستەکی و ئامانجدار ‹این که کار نشد، بگیری بخوابی: ئەمە نەبوو بە کار، لیٚ بکەوی بنووی› ٤. ئیش؛ پژگاڵ؛ وەن؛ سەرگەرمی؛ کار و بار؛ ئەوەی کەسیٚک بە خۆیەوە خەریک دەکا ‹کار دستی؛ کار هنری: پیشەی دەستی؛ کاری هونەری› ٥. پیشە؛ هەرمان؛ هەرمانە؛ کاربەند؛ لیهاتوویی بۆ بەڕیوە بردنی شتیٚ یان بەدیهیٚنانی بەرهەمیٚک ‹تار زدن کار تو نیست: تار ژەندن کاری تۆ نیە› ٦. شۆپ؛ شوێنەما؛ ئاسەوار؛ بەرهەمی چالاکیەک ‹این باید کار موش باشد: ئەمە دەبیٚ کاری مشک بیٚ› ٧. گیر؛ گرفت؛ دژواری ‹کسی به کار مردم بیچاره نمی‌رسد: کەس بە گرفتی خەڵکی بەستەزماندا ڕاناگا› ٨. بار و دۆخ؛ حاڵ و باڵ ‹کارم از گریه گذشته‌ست بدان می‌خندم: کار لە شیوەن تیٚپەڕیوە، بۆیە وا پیٚدەکەنم› ٩. بەرهەم؛ ئەوی دروست‌کراوە ‹این مجسمه کار استاد هادی ضیاءالدینی است: ئەم پەیکەرە کاری مامۆستا هادی زیائەدینیە› ١٠. چالاکی بە کەلک و پیٚویست، بەتایبەت بۆ چارەسەرکردنی گرفتیٚک ‹دکتر هر کاری بتواند می‌کند: دوکتور هەر کاریٚکی لە دەست بیٚ دەیکا› ١١. پیوەندی؛ کەین و بەین ‹کارشان از گفتگو گذشته، بزودی ازدواج می‌کنند: کاریان لە قسە لایداوە، بەم زوانە زەماوەن دەکەن› ١١. سەرجیٚیی؛ ئیلاقە؛ گان؛ تیٚکەڵاوی جینسی.

■ کار بیرون: کاری دەرەوە؛ هەرمانۆ بەری؛ فرمانی دەرۆ؛ چالاکی دەرەوەی ماڵ. بەرانبەر: کار خانه

کار جنون فیل: [مجازی] کاری فیل؛ کار فیل؛ کاری زۆر دژوار.

کار خانه: کاری ماڵەوە؛ کاری نیٚوماڵ؛ هەرمانۆ یانەی؛ کاروو دلیٚ یانەی. بەرانبەر: کار بیرون

کار دستی: کاری دەستی؛ کاری دەستکرد؛ چالاکییٚ کە بە دەست دەکریٚ. بەرانبەر: کار ماشین؛ کار فکری

کار سیاه ☜ کار گل

کار فکری: کاری فیکری؛ کاریٚ کە لیٚهاتوویی هزر و هۆشی پیٚویستە.

کار گل: [کنایی] قورەکاری؛ کۆڵ‌کیٚشی؛ زەنگەنارە؛ کاری کەرترین؛ کاری دژوار و کەم بایەخ: کار سیاه

کار ماشینی: کاری ماشینی: ١. کاریٚ کە زۆرتری ماشیٚن دەیکا. بەرانبەر: کار دستی ٢. [کنایی] کاریٚ کە هەر دووپاتە و چەندپاتە کردنەوەیە و هیچ پیٚویستی بە تیٚفکرین نیە.

▣ کار از پیش رفتن: کار چوونە پیٚشەوە؛ کار چوونە بەرەوە؛ سەرکەوتن لە کاردا ‹با این هوای سرد و نبودن کارگر فکر می‌کنی کار از پیش برود؟: بەم هەوا سارد و نەبوونی کاریگەرەوە پیٚت‌وایە کار بچیٚتە پیٚشەوە؟›. هەروەها: کار از پیش بردن

کار از کار گذشتن: [مجازی] کار لە کار ترازان؛ هەل و دەرفەت لە دەست چوون ‹حالا دیگر کار از کار گذشته غصه خوردن هم فایده‌ای ندارد: ئیٚستە ئیتر کار لە کار ترازاوە و خەفەت خواردن هیچی لیٚ شین نابیٚ›.

کار بالا گرفتن: [مجازی] کار/ شەڕ گەیشتنە قۆپی؛ توندتر و ڕاستەقینەتر بوونەوە ‹کار دعوا بالا گرفت: کاری شەڕ گەیشتە قوپی›.

کار به جای باریک کشیدن: [مجازی] ناسک بوونەوەی کار؛ حەستەم بوونەوەی کار؛ سەخڵەت و دژوار بوونەوەی بار و دۆخ ‹زن و شوهر کارشان به جای باریک کشید: ژن و مێردەکە کاریان ناسک بوونەوە›.

کار به کار کسی نداشتن: کار بە کاری کەسێکەوە نەبوون: ۱. خۆ هەڵنەقورتان لە کاروباری دیتراندا ۲. لە هیچ کارێکدا نەبوون؛ لە کارێکدا بەشدار نەبوون ‹نمی‌دانم آزاد را چرا گرفتند، او که کار به کار کسی نداشت: نازانم ئازادیان بۆچی گرت، خۆ ئەو لە هیچ کارێکدا نەبوو›.

کار بیخ پیدا کردن: [مجازی] کار قووڵ بوونەوە؛ کار خراپتر و ناخۆشتر بوون؛ کار بن گرتن ‹یک روز فهمیدم کار بیخ پیدا کرده و به طلاق و طلاق‌کشی کشیده: رۆژێک زانیم کار قووڵ بوەوە و کێشاویەتە تەلاق و تەلاق‌کاری›.

کار پیدا کردن: کار پەیدا کردن؛ کار دۆزینەوە.

کار تراشیدن: [مجازی] کار بۆ تاشین؛ کار بۆ دۆزینەوە (و دەردیسەری دان) ‹ریسمان هر روز برایم کار تازه‌ای می‌تراشید: سەرۆکمان هەموو رۆژێک کارێکی تازەی بۆ دەتاشیم›.

کار تمام بودن: کار تەواو بوون؛ کار برانەوە؛ کار برپایەوە؛ کۆتایی هاتنی رەوتێک ‹کار تمام است، فردا برمی‌گردیم: کار تەواوە، بەیانی دەگەڕێینەوە›: کار یک‌سره شدن

کار خوابیدن: [مجازی] کار داکەوتن؛ کار خەوتن/ خەفتن ‹دو ماه است که کار خوابیده و ما بیکاریم: دوو مانگە کارەکە داکەوتووە و ئێمەش بێکارین›.

کار دادن: کار پێدان؛ کار دان؛ کار دا پنەی؛ پیشەیەک بە کەسێک دان ‹می‌خواست توی مغازه‌اش به او کار بدهد: گەرەکی بوو لە دووکانەکەیدا کاری پێبدا›.

کار داشتن: کار بوون؛ کار هەبوون؛ هەرمان/ کار بیەی: ۱. سەرقاڵی کار یان پیشەیەک بوون ‹من کار دارم و نمی‌توانم بیایم: ئەمن کارم هەیە و ناتوانم بێم› ۲. کار لێ‌کەوتن؛ کار پێ بوون؛ کار بە کەسێ بوون ‹با آزاد کار داشتم، ولی امروز پیدایش نکردم: کارم بە ئازاد بوو، بەڵام ئەمڕۆ نەمدۆزیەوە›.

کار دست کسی دادن: [مجازی] کەسێ تووش کردن؛ کەسێک ئاوقەی دەردیسەر یان سەخلەتێک کردن ‹با این مقاله کار دستمان دادی: بەم وتارەوە تووشت کردین›.

کار را پخته کردن: [مجازی] لە توێکڵ دەرهێنان؛ پەسای کار نانەوە؛ ئاردی دابێژتن و کەپەکی رشتن؛ پێداویستگەلی کار دابین‌کردن ‹هر وقت کار را پخته کردی، به من خبر بده: کاتێ لە توێکڵ دەرت‌هێنا، ئاگادارم کە›.

کار را خواباندن: [مجازی] کار راگرتن؛ کار خەواندن ‹ارباب کار را خواباند و همه را بیرون کرد: ئاغا کارەکەی راگرت و هەمووی دەرکرد›.

کار راه افتادن: کار کەوتنەوە رێ؛ دەسپێکردن یان درێژە دانەوەی کار ‹پس از سه ماه دوندگی، دوباره کار راه افتاد: دوای سێ مانگ هەڵات‌ـ هەڵات، دیسان کارەکە کەوتەوە رێ›.

کار کردن: کارکردن؛ کارکەردەی: ۱. خەبتان؛ خەبتین؛ گورەیش؛ گۆریایش؛ فەرمان/ فرمان کردن ‹آرام در اداره کار می‌کند: ئارام لە مەزرینگەدا کار دەکا› ۲. ئەنجامدانی کاری خوازراو ‹این رادیو کار می‌کند: ئەم رادیۆیە کار دەکا›.

کار کردن خر و خوردن یابو: [مجازی] کار بۆ کەر و خواردن بۆ بارگین؛ زەحمەت کێشانی کەسێک و هەڵگرتنەوەی کەسێکی‌تر.

کار کردن شکم: کار کردنی سک.

کار کسی به کسی/ جایی افتادن: [کنایی] کەل کەسێ لە کەسێ/ جێگایەک کەوتن: ۱. یارمەتی کەسێک پێویست بوون ‹چند بار

**که رفقا** کارشان به آرام افتاد، **الحق از هیچ کمکی مضایقه نکرد: چەند جار کە** دۆستان کەلیان لە ئارام کەوت، **خوا هەڵناگرێ، ئەوەی لە دەستی دەهات کردی**›. ۲. *[کنایی]* کاری کەسێک کەوتنە (لای) کەسێ یان جێگایەک؛ پێوەندی هەبوون ‹**خدا نکند** کار کسی به این ادارەها بیافتد: **خوانەکا** کەس کەلی لەم مەزرینگانە بکەوێ›.

**کار کسی درآمدن:** تووش بوونی کەسێک؛ دەردیسەری بۆ کەسێک خۆش بوون ‹**از امروز** کار من درآمد، **باید خانەداری و بچەداری کنم: لە ئەمرۆوە** تووش بووم، دەبێ ماڵ بەڕێوە بەرم و منداڵ بەخێو بکەم›.

**کار کسی را درست کردن:** کاری کەسێک جێبەجێ کردن؛ کارو یۆی وەش کەردەی؛ داخوازی کەسێک بەجێ هێنان.

**کار کسی را راه انداختن:** کاری کەسێک ڕێخستن؛ کارو یۆی ڕێک وسەی؛ نیازی کەسێک بەجێ هێنان.

**کار کسی را ساختن:** *[مجازی]* قەباڵەی کەسێک پێچانەوە؛ لە ڕیشەی کەسێک دان؛ قاڵی کەسێک بڕینەوە؛ کەسێ کوشتن یان گەزەنێکی ئاستەمی پێ گەیاندن ‹**یک شب ریختند سرش و** کار او را ساختند: شەوێک ڕژانە سەری و قەباڵەیان پێچایەوە›.

**کار کسی روی غلتک افتادن:** *[مجازی]* ئاشی کەسێک کەوتنە گەڕان؛ پێش چوونی کاری کەسێک ‹**کم‌ـکم** کار او روی غلتک افتاد **و توانست درآمد خوبی بدست آورد: بەرە ـ بەرە** ئاشی کەوتە گەڕان و **توانی دەسهاتێکی باش بە دەست بێنێ**›.

**کار کسی زار/ ساخته بودن:** *[مجازی]* حاڵی کەسێک شڕ بوون؛ سەگ بە حاڵی کەسێک نەبوون؛ لە دۆخێکی خراپدا بوون.

**کار کسی سکّه بودن:** *[مجازی]* نانی کەسێک لە ڕۆندا بوون؛ لە دۆخێکی باشدا هەبوون ‹**این روزها** کار لباس فروشها سکه است: **لەم ڕۆژانە** نانی گنجفرۆشان لە ڕۆندایە›.

**کار کسی گذشتن/ راه افتادن:** کاری کەسێک بەڕێوە چوون/ کەوتنە ڕێ؛ کاروو یۆی کەوتەیوە ڕا؛ نیازی کەسێک بەجێ هاتن ‹**با همین اره** کار من می‌گذرد: **هەر بەم هەڕە** کاری من بەڕێوە دەچێ›.

**کار کسی گرفتن:** *[مجازی]* کار بۆ کەسێ گرتن؛ کاری کەسێک گرتن؛ کاری کەسێک سەرگرتن ‹**در بازار** کار او گرفت **و بزودی پولدار شد: لە بازاڕدا** کار بۆی گرتی **و دەوڵەمەند بۆوە**›.

**کار کشیدن:** کار لێ کێشانەوە؛ کارکێشانەوە ‹**گفتم این‌قدر از این ماشین** کار نکش: **گوتم ئەوندە لەم ماشینە** کار مەکیشەوە›.

**کار گذاشتن:** نانە/ نیانە کار؛ کار ناین؛ دامەزراندن؛ دانان؛ لە جێگایەک ڕێخستن.

**کار گرفتن:** کارگرتن؛ دامەزران؛ چوونە سەر کار.

**کار گره خوردن:** *[مجازی]* قۆرت/ نۆک/ ڕێخ تێکەوتن؛ کار پێچ خواردن؛ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ کۆسپ یان گرفتێک ‹کار آزاد گره خورده است: **کاری ئازاد** قورتی تیکەوتووە›.

**کاری صورت دادن:** کارێ کردن؛ کارێ لێ شین بوون ‹**اگر** کاری صورت داده بود **دلم نمی‌سوخت: ئەگەر** کاریکی کردبایە، **داخم نەدەهات**›.

**کار یک‌سره شدن** ☜ **کار تمام بودن**

**کار یک طرفی شدن:** کار یەکلا بوونەوە؛ بە ئاکام گەیشتن (باش یان خراپ) ‹**بگذار** کار یک‌طرفە بشود **و همه تکلیف خودشان را بدانند: بهێڵە با** کارەکە یەکلا ببیتەوە **و هەموو ئەرکی خۆیان بزانن**›.

**از کار افتادن:** لە کار کەوتن/ کەفتن؛ جە کار کەوتەی؛ لە گل کەوتن؛ گل و گوێز نەمان؛ هێز و توانایی ئەنجامدانی کار لە دەست دان

‹دیروز ساعتم از کار افتاد: دوێنێ کاتژمێرەکەم لە کار کەوت›.

**از کار انداختن:** لە کار خستن؛ بەر بە چالاکی یان کاری کەس یا شتێک گرتن.

**از کار برکنار شدن:** لە کار دەرکران؛ لە کار وەلانران؛ پیشەی خۆ لە دەست دان بە بۆنەی دەرکرانەوە ‹شهردار و دو تن از معاونانش از کار برکنار شدند: شارەدار و دوان لە جێگرانی لە کار دەرکران›.

**از کار درآمدن:** لە ئاو دەرهاتن؛ لە کڵ دەرهاتن؛ لێ‌دەرهاتن؛ لە کار دەرهاتن ‹این ماشین هم خوب از کار درنیامد: ئەم ماشینەش باش لە ئاو دەرنەهات›.

**به کار آمدن:** بە کار هاتن؛ (بە) دەرد خواردن؛ کەڵ‌گرتن؛ بە قازانج بوون ‹باشد یک روز به کار می‌آید: با ببێ رۆژێک بە کار دێت›.

**به کار افتادن:** کەوتنە/ کەفتنە کار؛ کارێک دەست پێکردن ‹به کار افتادن ماشین: کەوتنە کاری ماشێن›.

**به کار انداختن:** خستنە/ خستنەوە کار؛ ڕێخستن؛ خستنە جوولەوە ‹به کار انداختن این موتور هزینه دارد: خستنە کاری ئەم موتورە خەرجی هەیە›.

**به کار بردن:** کردنە کار؛ کار پێ‌کردن؛ وەکوو ئامێرێک کەڵک لێ‌وەرگرتن ‹دو کیلو میخ به کار بردم: دوو کیلۆ بزمارم کردە کار›.

**به کار بستن:** بردنە کار؛ بەڕێوە بردن؛ بەجێ هێنان (زۆرتر بۆ شێوەی کار، مۆچیاری و ڕاسپێری دەگوترێ) ‹هرچه تجربه داشتم به کار بستم: ئەوی ئەزموونم هەبوو بردمە کار›.

**به کار رفتن:** چوونە کار؛ وەکوو کەرەسە و ئامێرێک لێی‌کەڵک وەرگرتن ‹دو کامیون سیمان به کار رفته است: دوو کامیۆن سیمان چۆتە کار›.

**به کار کشیدن:** کار لێ‌کێشانەوە؛ کێشانە ژێر کار.

**به کار گرفتن:** گرتنە کار؛ وەکوو بەردەستێک کار پێ‌کردن ‹همه را به کار گرفتیم و یک خانەتکانی حسابی کردیم: هەموومان گرتە کار و گەسک‌ومالێکی چاکمان کرد›.

**در کار بودن:** لە کاردا بوون؛ ئەنەکار بیەی؛ بیەی کارەنە؛ بەشدار بوون لە کارێکدا ‹نمی‌دانم چه دستی در کار است: نازانم چ دەستێک لە کاردایە›.

**ـ کار**[٢]: *پیوازە.* ـکار: ١. ئەوەی بە ئامێرێک ئیش دەکات ‹سیمان‌کار: سیمان‌کار› ٢. ئەوەی لێزانیەکی هەیە ‹خاتمکار؛ جودوکار: خاتەمکار؛ جودۆکار› ٣. ئەوەی کە پیشە یان پلەیەکی تایبەتی هەیە ‹صاحبکار: خاوەن‌کار› ٤. ئەوەی کە شێوەیێکی کرداری تایبەتی هەیە ‹بدکار؛ گناهکار: خراپکار؛ گوناحکار› ٥. ـکێڵ؛ ـکاڵ؛ ئەوەی کە شتێک دەکێڵێ ‹پنبەکار: پەمووکار›.

**کارآزموده** / kārāz(e)mûde ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* لەکارزان؛ بەئەزموون؛ کاردیتوو؛ کاردیدە؛ کەیکوا؛ کاردیە؛ کاردیتی؛ کارەدار؛ کارەما؛ کارکەردە؛ لێزان و کارامە لە کارێکدا ‹معمار کارآزموده: نژیارڤانی لەکارزان›. هەروەها: **کارآزمودگی**

**کارآفرین** / kārāfarîn ، ـان/: *اسم.* کارداهێن؛ کەس یان ڕێخراوەیەک کە هەلی تازە بۆ کار بەدی‌دێنن.

**کارآگاه** / kārāgāh ، ـان/: *اسم.* بەرپرسی ئاسایش کە بە نهێنی لە دووی تاوانباراندایە. هەروەها: **کارآگاهی**

▣ **کارآگاه خصوصی:** کەسێک کە بە وەرگرتنی مز لە ڕێخراوە یان کەسێک، لێکۆڵینەوە لەمەڕ بابەتێک و دەرخستنی نهێنیەک دەگرێتە ئەستۆ.

**کارآموز** / kārāmûz ، ـها؛ ـان/: *اسم.* کەسێ کە خەریکی فێر بوونی کار یان پیشەیەکە.

کارآموزی / kārāmûzî ، ـها/:/سم کار و ڕەوتی فێر بوونی کار یان پیشەیەک.

کارا / kārā/ ☜ کارامَد

کارائی / kārā'î/ ☜ کارایی

کارابزار / kārabzār/ ☜ کارافزار

کارابین / kārābîn ، ـها/: [فرانسوی]/سم کارابین: ۱. ئالقەیەک وەکوو پیتی D بە زمانەیەکەوە، تەنافی تێدەچێ، تاشەوانان بە کاری دەبەن ۲. ئامرازێکی بەو شکلە بەلام زۆر گەورەتر بۆ دارەوانی و هەڵچوون بە پاچرادا ۳. جۆری تفەنگی لوولەکورت.

کاراته / kārāte/: [فرانسوی از ژاپنی]/سم کاراتە؛ وەرزشێکی شەڕەکی لای خۆرهەلاتە بە زەرپی دەست و پێ لە هەڤبەریان دەدەن.

کاراته‌باز / kārātebāz/: [فرانسوی/ فارسی] ☜ کاراتەکار

کاراته‌بازی / kārātebāzî ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/سم کاراتەبازی؛ کاری ئەنجامدانی کاراتە ‹نصف فیلم کاراته‌بازی بود: نیوەی فیلمەکە کاراتەبازی بوو›.

کاراته‌کار / kārātekār ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی]/سم کاراتەکار؛ کەسێ کە لە وەرزشی کاراتەدا ڕاهاتووە: کاراتەباز

کارافزار / kārafzār ، ـها/:/سم ئامراز؛ هامراز؛ ئالاڤ؛ ئامێر؛ ئامیر؛ کەرەستە؛ کەرەسە؛ کەرسە؛ ئەسبابی پێویست بۆ چالاکیەکی پیشەیی: کارابزار

کاراکتر / kārākter ، ـها/: [فرانسوی]/سم ۱. کەسایەتی؛ چۆنیەتی ڕەوشت و ئاکار ۲. هەر کام لە قارەمانگەلی فیلم، شانۆ یا چیرۆک ۳. نیشانەی بە کارچوو لە نووسین یان چاپدا (وەک پیت، خال و...).

کارامد / kārāmad/: صفت. کارا؛ کارامە؛ کارامەد: ۱. بەکەڵ؛ بەکەلک؛ کارکۆ؛ شیاو بۆ ئەنجامدانی کارێک ‹وسیله‌ی کارامد: ئامێری کارا› ۲. بەکار؛ تەی؛ فێرەکار؛ لەکارزان؛ کردە؛ بەدەست؛ بەدەس؛ خاراو؛ زانەڤان؛ چنگە؛ بە توانا لە ئەنجامدانی کاردا ‹این کارگر بسیار کارامد است: ئەم کرێکارە زۆر کارایە› ❋ کارا

کارامل / kārāmel/: [فرانسوی]/سم/شیمی/ کارامێل؛ قەنی سووتاو؛ ماکێکی قاوەیی تۆخ، کە لە داخکردنی قەن تا ۲۰۰ پلەک و لە بەر خوێگەلی ئامونیۆمەوە چێ دەبێ و وەکوو ماکێکی ڕەنگی لە خۆراکی و خواردنەوەدا، بۆ جوانی و تام بە کار دەچێ.

کارانه / kārāne ، ـها/:/سم کارانە؛ کارمز؛ پارەیەک کە لە بەرامبەر ئەنجامدانی کارێکی دیاریکراو (وەک چاو پێکەوتنی نەخۆش یان کاری سەعاتی) بە کەسێ دەدرێ.

کاراوان / kārāvān ، ـها/: [فرانسوی از فارسی]/سم کاراوان؛ هۆدەیەکی چەرخدار کە لە سەفەردا بە دوای ماشینیەوە دەبەستن و کەڵکی لێ وەردەگرن.

کاراوانچا / kārāvāncā ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/سم کاروانگا؛ جێگایەک لە شار یان ناوچەیەکی گەشتیاری بۆ مانەوەی کاراوانەکان.

کارایی / kārāyî/:/سم ۱. سوودمەندی؛ قازانجداری؛ قازانجدەری ‹باید دید میزان کارایی این برنامه چقدر است: ئەبێ بزانین هەندی سوودمەندی ئەم بەرنامەیە چەندە› ۲. کارتێکەری؛ کاریگەری؛ کارکۆیی ‹تلاشهای تو برایش هیچ کارایی نداشت: تێکۆشانت هیچ کارتێکەریەکی بۆی نەبوو› ❋ کارائی

کاربان / kārbān ، ـها؛ ـان/:/سم کارپێکەر؛ کاروەر؛ کاربەدەستی ڕێخستنی کەرەسە یان ماشینێک.

کاربر[1] / kārbar ، ـها؛ ـان/:/سم کاربەر؛ بە کار هێنەری ئامێرێک ‹باید نخست نحوه‌ی کار کردن با وسیله را برای کاربر توضیح داد: دەبێ لە پێشدا شێوەی کار کردن بە ئامێرەکە بە کاربەر بگوترێ›.

کاربر[۲]: صفت. کاربەر؛ پێویست بە هێزی کاری زۆر ‹ساخت این قطعات خیلی کاربر است: دروست کردنی ئەم کەرەسانە زۆر کاربەرە›.

کاربر / kārbor/: صفت. [مجازی] کاری؛ کاربڕ؛ پێداگر و بەتوانا لە ئەنجامدانی کار بە شێوەیەکی باش لە ماوەیەکی کەمدا ‹برای اجرای این برنامه یک مدیر کاربر لازم است: بۆ بەڕێوە بردنی ئەم بەرنامەیە بەرپرسێکی کاربڕ پێویستە›.

کاربرد / kārbord ، ـها/: اسم. کاربەری؛ بەکارهێنەری؛ دۆخ یان چۆنیەتی بە کار چوون؛ لە کارکردن یان چۆنیەتی کار پێکردنی شتێک ‹امیدوارم هرگز تفنگ کاربرد پیدا نکند: هیوادارم هەرگیز چەک بە کار نەچێت›.

کاربردی / kārbordî/: صفت. شیاوی کەڵک لێوەرگرتن: کاربستە

کاربری / kārbarî/: صفت. کاربەری؛ دۆخ یان چۆنیەتی کاربەر بوون.

کاربری / kārborî ، ـها/: اسم. کاربڕی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کاربڕ بوون ‹کاربری لازم را نداشت: کاربڕی پێویستی نەبوو›.

کاربسته / kārbaste/ ☜ کاربُردی

کاربکن / kārbokon/ ☜ کارکن

کاربن / kārbon/: [فرانسوی] اسم. ۱. کاغذ کاربن ☜ کاغذ ۲. ☜ کَربُن

کاربند / kārband ، ـها/: اسم. [بنایی] ئاجۆری سەرێک تاشراوی وەک پواز کە لە سەر تاق و شوێنی گەیشتنەوەیەکی دوو نیوتاقدا دەچێتە کار.

کاربوراتور / kārborātor ، ـها/: [فرانسوی] اسم. کاربراتور؛ ئامێرێک لە موتوردا کە سووتەمەنی بە تەوژمەوە لەگەڵ هەوادا تێکەڵ دەکا و دەیپژێنێتە نێو سیلەندرەوە: سوختآما

کاربولوی / kārboloy/: [؟] اسم. [شیمی] کاربولۆی؛ ناوی بازرگانی کاربیدی تەنگستەن کە ماکێکی یەکجار سەختە و داخ بوونی زۆریش کاری تێ ناکا، بۆ برینەوەی پۆڵا و چینی و... کەڵکی لێ دەبەن.

کاربیت / kārbît/: [از انگلیسی] ☜ کاربید کلسیم، کاربید

کاربید / kārbîd/: [انگلیسی] اسم. [شیمی] کاربیت؛ کاربید؛ تێکئالاوی دووانەیی کەربون لەگەڵ کانزایەک: کربور

▤ کاربید کلسیم: کاربیدی کالسیوم؛ ماکێکی سفتی بەرهەمهاتوو لە گەرمکردنی قسڵ و خەڵووز لە کوورەی کارەباییدا بە بلۆری خۆڵەمێشیەوە کە بۆ بەرهەم هێنانی گازی ئەسێتیلن بە کار دەڕوا: کلسیم کاربید؛ کاربیت؛ کربور کلسیم

کارپرداز / kārpardāz ، ـها؛ ـان/: اسم. دابینکار؛ کارگێڕی بەشی دابینکاری ڕێخراوەیەک.

کارپردازی / kārpardāzî ، ـها/: اسم. دابینکاری؛ مەزرینگە یان لقێکی ڕێخراوەیەک کە کاری دابینکردنی کەڵوپەلی پێویستی ڕێخراوەکەیە.

کارپوشه / kārpûše ، ـها/: اسم. پووشەی بەردەست؛ پووشەیەک کە نامە، بەڵگە و دۆسیەی لە بەر دەستی تێدا دادەنێن.

کارت / kārt ، ـها/: [فرانسوی] اسم. کارت: ۱. پسووله؛ پەتە؛ وەرەقەیەکی چکۆلەی مقەبایی کە شتێکی لە سەر چاپ کراوە ۲. پاسوور؛ وەرەقی کایە.

▤ کارت اعتبار(ی): پسوولەیەک کە لە لایەن ڕێخراوەیەکەوە بە کەسێک دەدرێ، تا بتوانێ بە قەرز شت بکڕێ.

کارت پستی ☜ کارتپستال

کارت تبریک: کارتی پیرۆزبایی؛ کارتێ کە بۆ پیرۆزبایی گوتن بە کەسێ دەدرێ.

کارت حساب: کارتی حەساب؛ جۆرێ کارت بۆ وەرگرتنی پارە لە کەرستەی خۆمەش.

کارت دعوت: کارتی بانگێشتن؛ کارتی دەعوەتی؛ کارتی بانگهێشتن بۆ بەشداری

کـردنی کەسێک لـە کۆبوونەوەیەکـدا (وەک زەماوەن).

**کارت ساعت:** کـارتی سـەعات؛ کـارتی تۆمـار کردنی کاتی هاتن و ڕۆیشتنی کارگێڕ.

**کارت شناسایی:** پێناسە؛ هەویە؛ کارتێک زۆرتر بە وێنەوە کە ناو و پێناسەی خاوەنەکـەی لـە سەرە.

**کارت عضویت:** کارتی ئەندامەتی؛ کارتـێ کـە نیشانەی ئەندام بـوونی کەسـێ لـە ڕێخـراوە، ئەنجومەن یان حیزبێکە.

**کارت ویزیت:** کارتی ویزیـت؛ کارتـێ کـە بـە سەریەوە ناو و پیشەی کەسێک چاپ‌کـراوەوە و زۆرتر بۆ خۆ ناساندن پێشکەشی دەکا.

⊡ **کارت زدن:** کارت لێدان؛ تۆمارکردنی کـاتی هاتن و ڕۆیشتن لە سەر کارت، بە کەرسـتەی خۆمەش.

**کارت‌پستال** / kārtpostāl ، ـها/: [فرانسـوی]/اسم. کارت‌پوستاڵ؛ مقەبایەکی وێنـە لـە سـەر چـاپ کراو کە بە پشتیەوە دەنووسن و بە جێـی نامـە، بۆ جێژنەپیرۆزە و شاباش بۆ یـەکتری دەنێـرن: **کارت پستی**

**کارت‌پول** / kārtpûl ، ـها/: [فرانسوی/ یونانی]/اسم. کـارت‌پـووڵ؛ کـارتێکی بـانکی بـۆ مشـتەریانی تایبەت کە بتوانن مامڵەی پێوە بکەن.

**کـارتر** / kārter ، ـهـا/: [فرانسـوی]/اسم. کـارتیر؛ کارتل؛ جابەی ژێر موتور کە ڕۆنی تێ‌دەکـرێ و میل‌لەنگ و شاتونی تێدایە: **کارتل**

**کارتل** / kārtel ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ۱. کارتێل؛ یەکیـەتی پیشـەگەران؛ هاوقۆڵـی چەنـد دامەزراوەی گەورەی ئابووری بۆ گرتنە دەسـتی بازاڕ ۲. ☜ **کارتر**

**کارتن** / kārton ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ۱. کارتۆن؛ کارتۆنە؛ جەعبەی مقەبایی گەورە بۆ تێتانی کالا ۲. ☜ **کارتُون**

**کارتنـک** / kārtonak ، ـهـا/:/اسم. [گفتـاری] جۆلاتەنە؛ تەڤن‌پیرک؛ کەروو؛ تەباتۆر؛ تەبـەتۆر: ۱. تەڤـنک؛ تەڤـنۆک؛ تەونۆکـە؛ تەڤـنەپرک؛ تەڤنەپیر؛ تەڤـن‌پیرکـێ؛ تەڤـن‌پـیر؛ تەنۆشـک؛ هـەلاوە؛ کەرتێنـە؛ سـروا؛ داوێکـی تۆڕئاسـایە داوتەنـە دەیچنـێ و مێـرووی وەک مـێش و مێشوولەی پێ ڕاو دەکا ۲. ☜ **عنکبوت**

⊡ **کارتنک بستن:** جاوتەنـە نانـەوە؛ جۆلاتەنـە تەنین؛ هەلاوە بینەی.

**کارتوگرافی** / kārtog(e)rāfî/: [فرانسـوی]/اسم. نەخشەکێشی؛ کارتۆگرافی؛ کار و ڕەوتی نەخشە کێشان.

**کـارتون** / kārton ، ـهـا/: [انگلیسـی]/اسـم. ۱. کـارتون؛ فیلمـی لـە نەقاشـی دروسـت‌کـراو ۲. کارتون؛ چیرۆکی بە شێوەی کۆمەڵە نەقاشی نیشان‌دراو * **کارتُن** ۳. ☜ **کارتُن ـ ۱**

**کارجو** / kārcû ، ـها؛ ـیان/:/اسم. کارخواز؛ کەسێ کە بە دوای پیشەیێکەوەیە. هەروەها: **کارجویی**

**کارچاق‌کن** / kārčāqkon ، ـها/: [فارسی/ ترکی/ فارسی]/اسم. [مجازی] کارڕێکخەر؛ کەسـێ کـە بـۆ قازانجی خۆی یارمـەتی خەڵـک دەدا و گـرفتی کاریان چارەسەر دەکا. هەروەها: **کارچاق‌کنی**

**کارخانجـات** / kārxānecāt/: [فارسـی/ از عربـی] جمعِ ☜ **کارخانه**

**کارخانـه** / kārxāne ، ـهـا؛ کارخانجـات/:/اسم. کارخانە: ۱. شوێنێک بـە ماشـین و کەرسـتەی پێویسـتەوە بـۆ بەرهـەم هێنـانی کاڵایـەک ۲. [مجازی] موتـور یـان کەرەسـتەی هێـزدەر و بەڕێوەبەر ‹کارخانەی بدن: کارخانەی لەش›.

**کارخانـه‌دار** / kārxānedār ، ـهـا؛ ـان/:/اسم. کارخانەدار؛ خاوەنی کارخانە.

**کـارخرابی** / kārxarābi/: [فارسـی/ عربـی] /اسم. [گفتاری] ۱. گەنکاری؛ گووکاری؛ هەڵەی قـورس ۲. کاری میزتن یان ڕیان.

**کارد** / kārd ، ـها/:/اسم. کێرد؛ وێرد؛ کارد؛ کارت؛ کاردی؛ کیەرد؛ کارچوو: ۱. گەرنک؛ ئامرازی بـە

دەستەی کورت و دەمی کانزایی تیژەوە بۆ برین ۲. ئامێری برین لە ماشینی پیشەسازیدا ۳. خەنجەر؛ خنجەر؛ خینگر؛ بدگە.

⊡ **کارد به استخوان (کسی) رسیدن:** *[مجازی]* گەیشتنە گیانی کەسێک؛ گیانەسەر بوون؛ دژواری و سەخلەتی گەیشتنە ڕادەیەک چیتر بڕست نەمان ‹دیگر کارد به استخوانم رسیده بود و نمی‌توانستم ساکت بنشینم: ئیتر گەیشتبووە گیانم و نەمدەتوانی بێدەنگ بم›.

**کارد خوردن:** چەقۆ خواردن؛ چەقۆ بەرکەوتن؛ کارد واردەی؛ بە کارد بریندار بوون. هەروەها: **کارد زدن**

**کارد کشیدن:** چەقۆ کێشان؛ کارد کێشتەی؛ بە چەقۆوە هەڵمەت بردن ‹کارد را کشید و افتاد به جانش: چەقۆی کێشا و کەوتە گیانی›.

**کارد و پنیر بودن:** *[مجازی]* وەکوو مشک و پشیلە بوون؛ کارد و پەنێر بوون؛ ئاگر و پووش بوون؛ زۆر دوژمن و نەیاری یەکتر بوون ‹این دو همسایه با هم کارد و پنیر بودند: ئەم دوو جیرانە پێکەوە وەکوو مشک و پشیلە بوون›.

**کاردار** / kārdār ، ـان/: *اسم.* کاردار؛ بەرپرسی ڕامیاری دەوڵەتێک لە وڵاتێکی‌تر، کە لە نەبوونی باڵیۆزدا، جێگریەتی.

**کاردان**[1] / kārdān/ ☜ **میل‌کاردان**

**کاردان**[2] / ـها؛ ـان/: *صفت.* ۱. لێزان؛ کاربین؛ کارزان؛ کارامە؛ کاردرووس؛ کاردروست؛ چێ؛ گۆرە؛ لە کارزان؛ خاوەن سەردەرچوویی باش لەمەڕ کارێکەوە ‹کار را باید به کاردان سپرد: کار دەبێ بە لێزانی بسپێردرێ› ۲. خاوەن خوێندنی باڵا، پلەیەک لە لیسانس خوارتر.

**کاردانی** / kārdānî/: *اسم.* ۱. سەردەرچوویی؛ لێزانی؛ کاربینی؛ کارزانی؛ کارامەیی؛ کاردروستی؛ کاردرووسی ۲. کاردانی؛ خولی خوێندنی باڵا، خوارتر لە لیسانس.

**کاردرمانی** / kārdarmānî ، ـها/: *اسم.* کاردەرمانی؛ دەرمانی نەخۆشی بە کار کردن، بەتایبەت بۆ نەخۆشیاری ڕۆحی و لەش‌کەهاڵ.

**کاردستی** / kārdastî ، ـها/: *اسم.* کاردەستی؛ کاردەسی؛ دەسکار؛ پیتەوایەک کە بە دەست دروست‌کراوە.

**کاردک** / kārdak ، ـها/: *اسم.* کارتەک؛ کاردەک؛ کەرەسەیەک بە تێغەیەکی کانزایی و دەم‌پانەوە بۆ ساوین و بلاوکردنەوەی ڕەنگ یان بەتانە.

**کاردکس** / kārdeks ، ـها/: [از انگلیسی] *اسم.* کارتێکس؛ کاردێکس؛ کارتێ کە هەند و ڕێکەوتی هێنان یان بردنی پیتەوایەک لە هەمارەوە یان بۆ هەماری تێدا نووسراوە.

**کاردینال** / kārdînāl ، ـها/: [فرانسوی از لاتینی] *اسم.* مەتران؛ کاردینال؛ زانای ئایینی فەلە پلەیەک خوارتر لە پاپ.

**کاردینه** / kārdîne ، ـها/: *اسم.* تێغ؛ تیغ؛ تێخ؛ کاردئاسا؛ هەر ئامێرێکی دەم‌تیژ.

**کاردیوگراف** / kārdiyog(e)rāf ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* *[پزشکی]* کاردیۆگراف؛ دەسگایەک کە چۆناوچۆنی لێدانی دڵ، بە سەر لاپەڕەیەکەوە تۆمار دەکات.

**کاردیوگرافی** / kārdiyog(e)rāfî/: [فرانسوی] *اسم.* *[پزشکی]* کاردیۆگرافی؛ کار و ڕەوتی تۆمار کردنی لێدانی دڵ لە سەر لاپەڕەی تایبەت.

**کاردیوگرام** / kārdiyog(e)rām ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* *[پزشکی]* نەواری دڵ؛ لاپەڕەی باریک و درێژی چەندخەتی تایبەت لە سەر تۆمارکراو، کە شاندەری چۆناوچۆنی کار کردنی دڵە.

**کارزار** / kārzār ، ـها/: *اسم.* *[ادبی]* شەڕ؛ جەنگ؛ هەلا؛ هەرف؛ کێشە.

**کارساز** / kārsāz/: *صفت.* کارساز؛ هۆی سەرکەوتن لە کاردا.

**کارسازی** / kārsāzî/: *اسم.* کارسازی: ۱. کاری وەدیهێنانی خواستی کەسێک ۲. دۆخ یان

چۆنیەتی کارساز بوون ۳. کاری ڕێخستنی گرفتی کەسێک، بەتایبەت بە دانی پارە.

**کارستان**[1] / kārestān/: اسم. کارانە؛ کارستان؛ کارسان؛ کاری گرنگ و بەرچاو ‹کاری کرد کارستان: کارێکی کارانەی کرد›.

**کارستان**[2]: صفت. کارانە؛ کارستان؛ کارسان؛ تایبەتمەندی کارێکی گەورە و بەرچاو ‹کاری بود کارستان: کارێکی کارانە بوو›.

**کارسنج** / kārsanc، ـها/: اسم. کارپێو؛ ئامێری ئەندازەگرتنی هەندی کارێ کە دەستەیەک ماسوولکە کردوویە.

**کارسینوم** / kārsînom، ـها/: اسم [پزشکی] کارسینوم؛ لکی لە نەخۆشی شێرپەنجەوە بەدیهاتوو.

**کارشکنی** / kāršekanî، ـها/: اسم [مجازی] چوکلەشکێنی؛ کارشێوێنی؛ کار و ڕەوتی تێکۆشان بۆ بەرگری لە پێش چوون و سەرکەوتنی کارێک ‹برخی در کار او کارشکنی می‌کردند: بڕێک لە کارەکەیدا چوکلەشکێنیان دەکرد›. هەروەها: **کارشکن**

**کارشناس**[1] / kāršenās، ـها؛ ـان/: اسم. کارناس: ۱. کەسێ کە لە بواری فەننی یان زانستیەوە لێزانە ‹کارشناس کشاورزی: کارناسی کشتوکاڵ› ۲. کارزان؛ گۆرە؛ لە کارزان؛ کارەما؛ هێکار؛ فێرەکار؛ کەسێ کە لە لایەن ڕێخراوەیەکەوە بەرپرسی پێڕاگەیشتن لە بواری تایبەتدایە ‹کارشناس شهرداری: کارناسی شارەداری›.

▣ **کارشناس ارشد**: ماستیر؛ فەوق‌لیسانس.

**کارشناس**[2]: صفت. کارناس: ۱. دوڕناس؛ کارزان؛ لە کار زان؛ سەردەرچووگ؛ پسپۆڕ لە بواری کار و زانستەوە ۲. لیسانس.

**کارشناسی** / kāršenāsî/: اسم. کارناسی: ۱. لێزانی؛ دۆخ یان چۆنیەتی فێرەکار بوون ۲. لیسانس؛ کارشناسی؛ خولی بالای خوێندن، کە ماوەی چوارساڵە.

▣ **کارشناسی ارشد**: ماستیری؛ فەوق‌لیسانس؛ خولی بالای خوێندن پلەیەک دوای لیسانس و پێش دوکتوری.

**کارفرما** / kārfarmā، ـها؛ ـیان/: اسم. خاوەن‌کار؛ ساحێب‌کار؛ خاوەن‌فەرمان؛ کەسێ کە کار بە کرێکاران دەدا ‹کارفرما جمعی از کارگران را بیرون کرد: خاوەن‌کار تاقمێ لە کرێکارانی دەرکرد›.

**کارکرد** / kārkard, kārkerd، ـها/: اسم. کاردا؛ ڕادەی کاری ئەنجامدراو ‹کارکرد او در هفته پنجاه صفحه بود: کاردای لە حەفتەیەکدا پەنجا لاپەڕە بوو›.

**کارکرده** / kārkarde/: صفت. کارکردوو؛ کارینای؛ کارکردە؛ لکار؛ دەکارکراو ‹چرا پلویز کارکرده را به جای نو به من فروختی؟: بۆچی پلاوپەزی کارکردووت لە بری نوێ بە من فرۆشت؟›.

**کارکشتگی** / kārkoštegî/: اسم [مجازی] کاردیتوویی؛ کەیکوایی؛ کاردیدەیی؛ کارامەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کارزان و سەردەرچوو بوون.

**کارکشته** / kārkošte، ـها/: صفت. [مجازی، گفتاری] کاردیتوو؛ کارەما؛ کەیکوا؛ کاردیدە؛ کاردیە؛ کاردیتی؛ قەیرە؛ کارامە و لێزان ‹سارا معلم کارکشته‌ای است: سارا مامۆستایەکی کاردیتووە›.

**کارکن**[1] / kārkon/: اسم [گفتاری] ڕەوانکەر؛ زگ ڕەوانکەر؛ کارکون؛ ڤژۆکەر.

**کارکن**[2]: صفت. [گفتاری] کاری؛ کارکەر؛ کار لێهاتوو؛ خاوەن خوو و هۆگرەتی کارکردن ‹اینجا به یک آدم کارکن نیاز دارد: ئێرە کەسێکی کاری پێویستە›.

**کارکنان** / kārkonān/: اسم. کارگێڕان؛ بەڕێوەبەران؛ کۆی کەسانێک کە لە جێگایەک کار دەکەن.

**کارگاه** / kārgāh، ـها/: اسم. کارگا؛ کارگە؛ کارەگا: ۱. جێگایەک کە یەک یان چەند کاریگەر و سەرعەمەلە کاری تێدا دەکەن ‹کارگاه

ساختمانی: کارگای ساختومانی› ۲. کارخانەیێکی چکۆلە کە زۆرتر خاوەن‌کاریش لەگەڵ کاریگەراندا کار دەکا ‹کارگاه آهنگری: کارگەی ئاسنگەری› ۳. ئامرازی گولدوورین کە زۆرتر بە شێوەی دوو جەغزی تۆتۆیە: کلاف

■ کارگاه هنری: کارگای هونەری؛ کارگەیەک کە کەس یان کەسانێک لە سەر کارێکی هونەری تایبەت (وەکوو گولسازی، پەیکەرتاشی و ...) کار دەکەن.

کارگاهی / kārgāhî/: صفت. کارگایی؛ کارگەیی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە کارگاوە ‹مقررات کارگاهی: پێودانی کارگایی› ۲. شیاو بۆ کارگا ‹چرخ خیاطی کارگاهی: چەرخی دروومانی کارگایی›.

کارگر[1] / kārgar, kāregar/. ـها؛ ـان/: اسم. کاریگەر؛ کرێکار؛ کارگەر؛ کارکەر؛ مەڕدا؛ فرمانکەر؛ خەباتکەر؛ خەباتکار؛ پالە؛ پەرخات؛ شوولکەر؛ ئیشکەر؛ فەلە؛ عەمەلە؛ کەسێ کە بە ئەنجامدانی کار لە کارخانە یان کارگایەک لە خاوەن‌کار مووچە وەردەگرێ ‹کارگر راه‌آهن: کاریگەری هێڵی‌ئاسن›.

■ کارگر خانگی: بەردەست؛ بەردەس؛ دەس و پا؛ کاریگەری ماڵی؛ کرێکارێ کە لە ماڵێکدا کار دەکا (وەک نۆکەر، شێوکەر و...).

کارگر سنتی: کرێکارێ کە لە پیشە و کارێکی سوننەتیدا کار دەکا (وەک کلاشچن، تەونکەر و...).

کارگر صنعتی: کاریگەری پیشەیی؛ کرێکارێ کە لە پیشەیەکدا کار دەکا و مووچە وەردەگرێ. هەروەها: کارگر کشاورزی

کارگر[2]: کاریگەر؛ کارتێکەر؛ کارکۆ؛ کارساز ‹حرفهایم در او کارگر شد: قسەکانم بۆ ئەو کاریگەر بوو›.

کارگردان / kārgardān/. ـها؛ ـان/: اسم. دەرهێنەر؛ کەسێ کە پیشەی بەڕێوە بردنی نومایشنامە یان دروست‌کردنی فیلمە.

کارگردانی / kārgardānî/: اسم. دەرهێنەری: ۱. کار و ڕەوتی سەرپەرشتی‌کردنی ئەکتەر و وێنەهەڵگران و کەسانی‌تر لە کاری فیلم‌سازی یان نومایشدا ۲. پیشەی دەرهێنەر.

کارگروه / kārgurûh, -gorûh/. ـها/: اسم. لێژنە؛ کۆڕێک بۆ توێژینەوە، و لە دوو کەوتن و پێڕاگەیشتنی کارێک.

کارگری[1] / kārgarî/: اسم. کرێکاری؛ کارگەری؛ کاریگەری؛ کارکەری: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی کرێکار بوون ۲. پیشەی کرێکار.

کارگری[2]: صفت. کرێکاری؛ کاریگەری؛ پێوەندیدار یان هاوگەر بە کارگەرەوە ‹اتحادیەی کارگری: یەکیەتی کرێکاری›.

کارگزار / kārgozār/. ـها؛ ـان/: اسم. کارگێڕ؛ ڕێخەر؛ فەرمانگوزار؛ کارگوزار؛ سووورباش؛ فرمانگوزار؛ زاوت؛ کار پێکهێنەری بەردەستی دەسەڵاتدار.

کارگزاری / kārgozārî/: اسم. کارگێڕی؛ کارگوزاری؛ فەرمانگوزاری: ۱. پیشە یان کاری کارگێڕ ۲. /ـها/ جێگەی کاری فەرمانگوزار.

کارگزین / kārgozîn/. ـها/: اسم. کاربژێر؛ بەرپرسی کاربژێری.

کارگزینی / kārgozînî/. ـها/: اسم. کاربژێری؛ بەشێ لە ڕێکخراوەیەک کە بە سەر دامەزران، دیاری‌کردنی پیشە و دۆخی کارگێڕاندا ڕادەگا.

کارگشا / kārgošā/. ـیان/: صفت. [مجازی] کارڕێخەر؛ هۆی لاچوونی دژواری و کۆسپی سەر ڕێگەی کار ‹کمکهای او برایمان بسیار کارگشا بود: یارمەتیەکانی بۆ مە زۆر کارڕێخەر بوو›.

کارگشایی / kārgošāyî/. ـها/: اسم [مجازی] کارڕێخەری؛ کاری لابردنی دژواری کار، بەتایبەت لە ڕێگەی دانی وام و یارمەتی ماڵیەوە.

کارمایه / kārmāye/. ـها/: اسم. وزە؛ هێز؛ توانا؛

کۆسە؛ مایەی کار.

**کارمزد** / kārmozd، ـها:/اسم. مزد موووچە؛ کارمز؛ کارانە؛ پارەیەک کە لە بەرامبەر کارێکی دیاریکراوەوە بە کەسێک دەدرێ.

**کارمند** / kārmand، ـها؛ ـان:/اسم. کارمەند؛ کەسێ کە لە مەزرینگە یان شەریکەیەک بە شێوەی بەردەوام کار دەکا و مانگانە (یان لە برێ وڵاتدا ساڵانە) وەردەگرێ ‹کارمند اداره: کارمەندی مەزرینگە›.

**کارمندی**[1] / kārmandî/:اسم. کارمەندی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی کارمەند بوون ٢. پیشە و کاری کارمەند.

**کارمندی**[2]: صفت. کارمەندی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کارمەندەوە ‹حقوق کارمندی: مووچەی کارمەندی›.

**کارن** / kāren/:اسم. کارین: ١. هۆزێ لە ڕۆژهەڵات و باشووری وڵاتی بێرمەوە ٢. ـها/ هەر یەکە لە کەسانی ئەو هۆزە ٣. زمانی ئەو هۆزە کە تێکەڵێکە لە زمانی چینی و سیامی.

**کارنامک** / kārnāmak، ـها:/اسم. نووسراوەیەک بریتی لە کورتکراوەی چەند ئاگاداری گرینگ لەمەڕ کەسێکەوە (وەک نێو، زاینگە، هەندی خوێندن و...).

**کارنامه** / kārnāme، ـها:/اسم. کارنامە؛ گۆڤان‌نامە: ١. بڕوانامە؛ باوەڕنامە؛ بەرگەیەک کە نمرە و چۆنیەتی خوێندنی قوتابی تێدا نووسراوە ٢. پسوولەی سیایی کارێ کە کراوە (بۆ کەس یان دامەزراوەیەک).

**کارناوال** / kārnāvāl، ـها: [فرانسوی]/اسم. کۆسەکاری؛ کارناواڵ؛ جێژن گرتنێکی تایبەت بریتی لە هەڵپەڕکێ، ئاواز و خۆشی و شایی گرۆیەک لە خەڵک کە جلی ڕەنگامە لەبەر دەکەن، نقاب لێ دەدەن و خۆیان وەک گیانەوەران لێ دەکەن.

**کارنگار** / kārnegār، ـها:/اسم. ئامێری ئەندازەگرتنی توانایی کاری ماسوولکەیەک.

**کارنما** / kārnemā، ـها:/اسم. کاتالوگ؛ پێڕستێ کە دەسهات یان پیتەواگەلی ڕێخراوەیەکی تێدا ناسێنراوە.

**کارواش** / kārvāš، ـها: [انگلیسی]/اسم. ماشین‌شۆری؛ کارواش؛ کارگەی خێرا شۆردنی ماشین: **ماشین‌شویی**

**کاروان** / kār(e)vān، ـها:/اسم. کاروان؛ کارەوان؛ کاربان؛ کارڤان؛ کاروۆ؛ قافڵە؛ گرۆیەک لە کەسان خەڵک یا پێڕاگوێزانێ کە پێکەوە بەرەو شوێنێک دەچن ‹کاروان حج: کاروانی حەج›.

**کاروان‌سالار** / kār(e)vānsālār، ـها؛ ـان:/اسم. [ادبی] سەرکاروان؛ سەرقافڵە؛ قافڵەچی.

**کاروانسرا** / kār(e)vānsarā، ـها:/اسم. کارمسەرا؛ کاروانسەرا؛ خان؛ جێگەی پشوودانی قافڵە بەڕێگادا.

**کاروانک** / kārvānak، ـها:/اسم. کاروانە؛ کەرەواڵە؛ کەرەوانکە؛ کەروان؛ پەلەوەرێ کە لە مراوی دەکا، دەندووکی خوارە و لە دەماوان دەژی.

**کاروانکش** / kār(e)vānkoš/:اسم. [نجوم] شعرای یمانی ☜ **شِعرا**

**کاروبار** / kār-o-bār، ـها:/اسم. کار و بار؛ کار و دەسهاتەی کار ‹کار و بار داماد بد نیست، از خودش خانه و ماشین هم دارد: کار و باری زاوا خراپ نیە، بۆ خۆی ماڵ و ماشینیشی هەیە›.

**کاروتن** / kāroten/: [فرانسوی]/اسم. کارۆتین؛ ڕەنگدانەی نارنجی برێ ڕووەک (وەک گێزەر و تەماتە) و زەردێنەی هێلکە و چەوری لەش و... ئەم ماکە لە جەرگی مۆرغەدارانـدا دەبێتە ویتامین ئا.

**کارور** / kārvar، ـها؛ ـان:/اسم. کارەوەر؛ کارپێکەر؛ کار وەدەستی خستنە ڕێ و کارکردن بە دەسگا یان ماشینێ.

**کاروِرز** / kārvarz ، ـها؛ ـان/:/اسم. خوێندکار یان کەسێ کە خوێندنی تازە تەواو بووە و لە ژێر دەستی مامۆستایەک لە جێگایەکدا کار دەکا.

**کاروکاسبی** / kār-o-kāsebî ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. [گفتاری] کسم و کار؛ کار و کاسبی؛ کەسابەت؛ کەسپ و کار.

▣ **از کار و کاسبی افتادن**: لە کسم و کار کەوتن؛ لە کار و کاسبی کەفتن ‹یک هفته است از کار و کاسبی افتاده‌ایم: **حەوتەیەکە** لە کسم و کار کەوتووین›. هەروەها: **از کار و کاسبی انداختن**

**کار و کسب** / kār-o-kasb ، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. پیشە؛ کار و کاسبی؛ کەسم و کار؛ کار و کەسب؛ کاری کڕین و فرۆشتنی پیتەوا.

**کاره**[1] / kāre/: صفت. [گفتاری] کارە؛ کاربەدەست، بەتایبەت کاری گرنگ ‹او در آن اداره برای خودش کاره‌ای است: لەو مەزرینگەیەدا بۆ خۆی کارەیەکە›.

**ـکاره**[2]: پیوَاژه. ـکارە؛ خاوەن کار ‹هیچ‌کاره: هیچ کارە›.

**کاری**[1] / kārî/: اسم. کاری: ١. چەشنێ بەهاراتی توند کە لە کوتانی بیباری سوور، شملی و زەردەچێوە دروست دەبێ ٢. چێشتێ کە وەها بەهاراتێکی تێکراوە (وەک پلاو یان مەیگوو).

**کاری**[2]: صفت. کاری: ١. کارا؛ بەکار؛ ئازا لە کار؛ چێ؛ کارلێهاتوو ‹مرد کاری: پیاوی کاری› ٢. کاریگەر؛ کارتێکەر؛ کارکۆ ‹زخم کاری: زامی کاری›.

**ـ کاری**[3]: پیوَاژه. ـکاری: ١. پێوەندیدار بە کارێکی دیاریکراوەوە ‹جوشکاری: جۆشکاری› ٢. ـکێلی؛ ـکالی؛ پێوەندیدار بە زەوی کێلانەوە ‹گندمکاری؛ دیمکاری: گەنمکاری؛ دەیمەکێلی›.

**کاریاب** / kāryāb ، ـها؛ ـان/: اسم. کاردۆز؛ کاروەدۆز؛ کەسێ کە کاری پەیدا کردنی کار بۆ بێکارانە.

**کاریابی** / kāryābî ، ـها/: اسم. کاردۆزی؛ کاروەدۆزی: ١. کاری دۆزینەوەی پیشە بۆ کەسانی‌تر ٢. ڕێخراوەیەک کە بۆ بێکاران کار دەدۆزێتەوە.

**کاریبو** / kārîbo/: اسم. کاریبۆ: ١. هۆزی سوورپێستی خەڵکی باکووری ئامریکای باشووری، ئانتیلی بچووک، هیندووراس و گواتمالا لە قەراخی زەریای کارایب ٢. /ـها/ هەر یەکە لە کەسانی ئەو هۆزە ٣. /ـها/ گیانەوەری گواندار لە تیرەی گەوەزن، کە بە پێی وەرزەکان ڕەنگی دەگۆڕێ و نێر و مێ، شاخیان هەیە.

**کاریر** / kār(i)yer ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ١. کاریێر؛ ڕێخراوەیەک کە کاری دامەزرانی پێوەندی تەلەیفوونی شاروشارە ٢. پێشینەی کاری ‹کاریر اداری: پێشینەی کاری لە مەزرینگە›.

**کاریز** / kārîz ، ـها/: اسم. کارێز؛ کەرێز؛ کەرێزە؛ کەهریز؛ کەهرێز؛ ڕێگەی ئاوی بە ژێر زەویدا کێشراو.

**کاریزکن** / kārîzkan ، ـها/: اسم. کارێزکەن؛ کارێزهەڵکەن؛ کارێزەکەن؛ کەسێ کە کارێز لێ‌دەدا.

**کاریکاتور** / kārîkātor, kārîkātûr ، ـها/: [فرانسوی از ایتالیایی]/اسم. کاریکاتور؛ وێنەی بە دەست کێشراوی کەس یان دیمەنێک کە بە شێوەیەکی حەنەکاوی یان بە مەبەستی تیز و تانە تێگرتن، لە برێ جێگەیدا زیادەڕۆیی کراوە.

**کاریکاتوری** / kārîkātorî,kārîkātûrî/: [فرانسوی] صفت. کاریکاتوری؛ بە شێوەی کاریکاتور.

**کاریکاتوریست** / kārîkātorîst, kārîkātûrîst ، ـها/: [فرانسوی] صفت. کاریکاتوریست؛ نەققاشێ کە کاریکاتور دەکێشێ.

**کازه** / kāze ، ـها/: اسم. ١. شوێنی دە کێو یان بیاوان هەڵکەنراو بۆ شەوێن و مانەوەی ڕێبواران یان گیانەوەران ٢. کاز؛ قۆختە؛ قۆلیت؛ قوخ؛

قۆخل؛ کۆختە؛ کۆخ؛ کۆزلاخ؛ کۆخک؛ کەوێڵی کاول ٣. کۆزەر؛ لکی دار کە ڕاوچی شتی پێوە دارەلۆز دەکا بەڵکوو گیانەوەران لێ بسلەمێنەوە ٤. کولک؛ کۆلا؛ کوولا؛ چیخ؛ چیخە؛ کەپر؛ خانووچکەی لە شووڵ و قامیش ٥. پالەوانە؛ فێلپا؛ داری بن دیرگ.

**کازینو** / kāzîno ، ـها/: [فرانسوی از ایتالیایی]/اسم. قومارخانە؛ کازینۆ؛ چەشنێ هوتێل یان چێشتخانە کە ژووری تایبەت بە قوماری تێدایە.

**کازیە** / kāz(i)ye ، ـها/: [از فرانسوی]/اسم. کازیە؛ ئەسبابێکی دوو ـ سێ تەبەقەی کانزایی یان پەلاستیکی، لە سەر مێزی دادەنێن و کاغەز و بەڵگەی بەردەستی تێدەچنن.

**کاس** / kās/: صفت. ١. کەوە؛ کەوو؛ کەوگ؛ ڕەنگی شینی زۆر تۆخ ٢. کاس؛ قووڵ؛ ڕۆچوو؛ قوپاو؛ قوپیا؛ قوپیاگ؛ بەرەو ناوەوە چەماو.

**کاساب** / kāsāb/: اسم. ئاوی شەومەنە؛ ئاوێ کە بە بۆنەی مانەوە لە جێگایەکدا ڕەنگی بۆر بووە.

**کاسب** / kāseb ، ـها؛ ـان؛ کَسَبه/: [عربی]/اسم. کاسب؛ کاسبکار؛ پیشەوەر؛ مامڵەچی؛ کەسێ کە ژیانی بە کڕین و فرۆشتنەوە بە ڕێوە دەچێ.

◘ **کاسب شدن**: [گفتاری] کاسب بوون: ١. خەریکی کسم و کار بوون ٢. دەرهێنان؛ دەسهاتێک بە دەست هێنان ‹امروز چیزی کاسب شدی؟: ئەورۆ شتێکت دەرهێنا؟›.

**کاسبرگ** / kāsbarg ، ـها/: اسم. قەپووشک؛ قەپووچک؛ قەپووچکە؛ تاسپەڕ؛ بەلگپەڕە؛ قونچکە گەلای وەک پەنجە کە پەڕەگەلی گوڵی لە سەرە و پتر کەسکە و جار و بارەش بە ڕەنگیترە.

**کاسبکار** / kāsebkār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] اسم. [گفتاری] کاسب؛ کاسبکار؛ پیشەوەر؛ مامڵەچی؛ مامەڵەگەر.

**کاسبی** / kāsebî ، ـها/: [عربی]/اسم. کاسبی؛ کاسپی: ١. پیشەی کاسبکار ‹کاسبی هم بد شغلی نیست: کاسبیش پیشەیەکی خراپ نیە› ٢. کاری کاسبکار ‹این روزها کاسبی‌اش خوب است: ئەم ڕۆژانە کاسبیەکەی باشە›.

**کاست** / kāset ، ـها/: [فرانسوی از ایتالیایی]/اسم. شریت: ١. قوتووئاسایەکی پەلاستیکی بۆ ڕاگرتن و هەڵکردنی شریتی دەنگ یان وێنە ٢. قاپۆلکە؛ قاپیلکە؛ قاپلۆخ؛ بەرگی زۆرتر ڕەق و ئەستووری ڕاگر و پارێزەری هەر شتێک.

**کاست** / kāst ، ـها/: [انگلیسی از پرتغالی]/اسم. کاست؛ نیزامی چینایەتی دینی هیندوو، کە لە سەر ئەو بنەمایە سەرپشکی ئابووری و کۆمەڵایەتی، میراتی و پیشە و کار و ژن و ژنخوازی لە نێو چینەکاندا پاوانکراوە.

**کاستن** / kāstan/: مصدر. لازم. متعدی. // **کاستی**: داشکای؛ **می‌کاهی**: دادەشکی؛ **بکاه**: داشکە// ◘لازم. ١. داشکان؛ کەم بوونەوە؛ کەمەو بوون؛ هەجنین؛ هەجنان؛ پەچکان؛ پچکین؛ کێم بوون؛ کەمەوە بیەی؛ کەم بیەیوە؛ کز بوون؛ دابەزینی شۆ و هەندی شتێک ‹از شدت چیزی کاستن: لە گوژمەی شتێک کەم بوونەوە› ◘متعدی. ٢. هندکاندن؛ هەلساندن؛ پچکاندن؛ پەچکاندن؛ کەم‌کردن؛ کێم‌کرن؛ کەمەوەکەردەی؛ کەم کەردەیوە؛ داشکاندنەوە؛ کەم‌کردنەوەی شۆ و هەندی شتێک ‹١٠ درصد از حقوقها کاستند: دە لە سەدی مووچەیان کەم کردەوە›. هەروەها: **کاستنی**

■ صفت فاعلی: **کاهنده** (داشکێن)/ صفت مفعولی: **کاسته** (داشکاو)/ مصدر منفی: **نکاستن** (دانەشکان)

**کاسته** / kāste/: اسم. [ریاضی] داشکاو؛ چەندیەتیەک کە لە یەکێکیتر کەم دەکرێتەوە: **مَفروق**

**کاستی** / kāstî ، ـها/: اسم. کەم و کورتی؛ کێم و کاسی؛ کێم‌وکۆڕی: ١. ناتەواوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کەمتر بوون لە هەندی پێویست و دڵخواز ٢. کەمایەسی؛ کێماسی؛

کێماتی؛ کێمانی؛ کێماهی؛ شکستی؛ نوون؛ ئاهوو.

**کاسجوک** / kāscok/: *اسم. [قدیمی]* ژیژو؛ ژیژۆ؛ ژیژی؛ ژژووک؛ ژیشک؛ ژووشک؛ ژووژک؛ ژویژوی؛ ژڤژی؛ ژووژوو؛ ژووژی؛ ژژوو؛ سیخور؛ ژیرکە؛ کولە؛ چولە؛ گیانەوەرێکی چکۆلەیە بە پێستێکی دڕکاویەوە.

**کاسک** / kāsk ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* خوودە؛ خوود؛ کوومزرخ؛ کڵاوی سەرپارێز؛ کڵاوێ کە ناوەوەی نەرمە و دەرەوەی لە کانزایە، بۆ پاراستنی سەر.

**کاسکت** / kāsket ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* کاسکیت؛ کڵاوپاساری؛ کڵاوێ کە پێشەوەی سەیوانی هەیە.

**کاسنی** / kāsnî ، ـها/: *اسم.* کاسنی؛ چەقەنە؛ چەقچەقە؛ چەقچەقۆک؛ چەقەنەک؛ هندووبا؛ گیاشیلاو؛ شیرەچاو؛ ئالفەگیایەکی گەڵابلاوی گوڵ ئاوی یان سپی و سوورکاڵە. بن و گەڵا و گوڵ و تووی ئەم گیایە دەرمانە.

▣ **کاسنی زرد:** پەپوولەپاییزە؛ پەپووەپاییزان؛ بایلکە؛ باویلکە؛ پشیلەپایزە؛ پشیپایزە؛ پشیلۆک؛ شەلەمینکەرە

**کاسنی فرنگی:** کاسنی سالادی؛ جۆرێ کاسنی لە سالادی دەکەن.

**کاسوواری** / kāsovārî/: [؟] ☜ شترمرغ استرالیایی، **شترمرغ**

**کاسه** / kāse ، ـها/: [از عربی] *اسم.* کاسە: ١. کاس؛ زەرک؛ تاس؛ قاپ؛ جام؛ جۆم؛ ترارک؛ بادی؛ بادیە؛ بایە؛ باییە؛ قاو؛ جامۆلە؛ وسکورا؛ دەفری دەمتاکی چێشت و تراو تێکردن ٢. جام؛ شتی ناو دەفر ‹یک کاسه آش آورده بود: کاسەیەک ئاشی هێنابوو› ٣. *[مجازی]* هەر شتێکی دەفرئاسا ‹کاسەی چشم: کاسەی چاو› ٤. *[گیاەشناسی]* قژمووک؛ قەپوشک؛ قەپووچک؛ کاسەی گوڵ.

▣ **کاسەی توالت:** لگن مستراح ☜ **لگن**

**کاسەی چشم:** زۆ؛ کاسەی چاو؛ قووڵایی چەمی؛ کۆرتکا چاڤ؛ قووڵکەی جێ چاو.

**کاسەی داغتر از آش:** *[مجازی]* ئەسکوێ لە دیزە بەقوڵتر؛ لە چوارشەممە سوورتر؛ کەسێ کە فڕی بە سەر کارێکەوە نیە، بەڵام لە خاوەنکارەکە شێلگیرترە.

**کاسەی زانو:** کەشکەژنۆ؛ کەشکەک؛ کەشک؛ کەشگەک؛ کەشکەزرانی؛ کەشکەزەنگوڵ؛ کەشکەوژنگ؛ کاسەئەژنۆ؛ کاسەزرانی؛ کوننەزرانی؛ قیتک؛ دەرقیتک؛ کۆتک؛ کوتیل؛ قۆمک؛ کاب؛ کابە؛ کابەک؛ کاسەی زرانی؛ کەشکۆ زەنگۆلا.

**کاسەی سر:** ئێسکەسەر؛ قاپێلکەسەر؛ قاقلۆک؛ قەحف؛ کاپۆڵ؛ کاپۆلک؛ کاتات؛ کاتک؛ کاژە؛ کاژەڕە؛ کاژەلاک؛ کافا؛ کاکۆت؛ کۆلۆخ؛ کاسەی سەر کە لە مرۆدا کە لە چەند ئێسک پێکهاتووە.

**کاسەی نبات** ☜ **کاسەنبات**

▣ **کاسەای زیر نیمکاسه بودن:** *[مجازی]* شتێ لە ژێر کڵاو/ سەردا بوون؛ ئاگر بێ دووکەڵ نەبوون؛ فێڵ و گزیەک لە کاردا بوون ‹گمان می‌کنم کاسەای زیر نیمکاسه است که این‌طور می‌ترسد: وا دەزانم شتێکی لە ژێر کڵاودایە ئاوا دەترسێ›.

**کاسەی چه کنم به دست گرفتن:** دەس لە پا درێژتر داکەوتن؛ پەنجە هەڵپێکان؛ دەستەو ئەژنۆ دامان؛ دژدامان ‹آخرش مجبور می‌شوی کاسەی چه کنم به دست بگیری: دواخری دەس لە پا درێژتر دادەکەوی›. هەروەها: **کاسەی چه کنم به دست کسی دادن**

**کاسەی صبر کسی لبریز شدن:** *[مجازی]* گیانە سەر بوونی کەسێک؛ تاقەت و پشوو لای کەسێک نەمان ‹کاری نکن که کاسەی صبرش لبریز شود و بیرونت کند: وا مەکە گیانەسەر ببێ و دەرت بکا›.

**کاسەبشقابی** / kāsebošqābî ، ـها/: [از عربی/ ترکی] اسم. [گفتاری] کۆنەسێن؛ وردەواڵەفرۆشێک کە جل و پیتەوای کۆنی ماڵان وەردەگرێ و بە کاسە و دەفر دەیگۆڕێتەوە.

**کاسەپشت** / kāsepošt ، ـها؛ ـان/: [از عربی/ فارسی] اسم. کیسەڵ؛ کیسی؛ کووسی؛ کسل؛ کێسو؛ کەسەپشت؛ کویسەلە؛ کاسەپشتی.

**کاسەترمز** / kāsetormoz ، ـها/: [از عربی/ روسی] اسم. کاسەی تورمز؛ کەرەسەیەکی دەفرئاسا لە پۆلا یان چودەن کە لینت و باقی پاژەکانی تورمزی تێدایە.

**کاسەساچمە** / kāsesāčme ، ـها/: [از عربی/ ترکی] اسم. بولبرینگ؛ دوو جەغزۆکە یان گرۆڤەری گەورە و بچووک بە ڕزنێ یان چەند ڕزن ساچمە لە بەینیاندا بە شێوەیەک کە دەکرێ هەر کام بە بارێکدا سوور بخۆن. لە هەموو چەرخێک و هەموو ئامرازی چەرخئاسادا بە کار دەچێ.

**کاسەکوزە** / kāsekûze ، ـها/: [از عربی/ از کردی] اسم. هەوەڕ: ١. قاپ و قاچاخ؛ کوڕوکاسە؛ کوڕکاسە؛ کڕکاسە؛ قوڕوقاو؛ قاپ و کەوچک؛ کاسە و کەوچک ٢. کەلپەل؛ کەلوپەل؛ هەوەڕێ؛ ئامان؛ ئیربار؛ کۆی ئامێر و ئەسبابانی کاری کەسێک.

▣ **کاسەکوزە را سر کسی شکستن:** [کنایی] کەسێ پیاو خراپ کردن؛ تاوانێک بە سەر کەسێکدا ساخکردنەوە و لەگەڵی بە شەر هاتن ‹آخرش کاسەکوزە را سر تو می‌شکنند کە چرا نگفتی!: دواخری تۆ پیاو خراپ دەکەن کە بۆ نەتگوت!›.

**کاسەکوزەی کسی را بهم ریختن:** [کنایی] کار و باری کەسێک تێکوەمەکان دان؛ شپرز کردنی کاری کەسێک؛ کاری کەسێک تێکدان ‹در این موقع برق رفت و کاسەکوزەمان را بهم ریخت: لەم کاتەدا کارەبا بڕا و کار و بارمانی تێکوەمەکان دا›.

**کاسەلیس** / kāselîs ، ـها؛ ـان/: [از عربی/ فارسی] صفت. [کنایی] چلکاوخۆر؛ گرتککرێن؛ چفتەلیس؛ کاسەلێس؛ بەرماوخۆر؛ پاشماوەخۆر.

**کاسەلیسی** / kāselîsî/: [از عربی/ فارسی] اسم. [کنایی] چلکاوخۆری؛ کاسەلێسی؛ کارەڕەهاتی لە ڕێگەی ماستاوکردن بۆ دیتران و پێدا هەڵگوتنیانەوە ژیان.

**کاسەنبات** / kāsenabāt ، ـها/: [از عربی/ عربی] اسم. کاسەنەوات؛ کاسەنەبات؛ نەباتێ کە بە شێوەی کاسە دروستکراوە.

**کاسەنمد** / kāsenamad ، ـها/: [از عربی/ فارسی] اسم. کاسەنەمەد؛ واشیری هێندێک قووڵی لاستیکی یان لە چێوپەمە کە گەورە و بچووکی هەیە و لە دەلانی ئاو و ڕۆنی موتور بەرگری دەکا.

**کاسەهمسایە** / kāsehamsāye ، ـها/: [از عربی/ فارسی] اسم. کاساوسا؛ کاسەهامسا؛ کاسەمسا؛ کاسەئاوسا؛ کاسەهاوسا؛ کاسەئاوسێ؛ کاسەدەراوسێ؛ کاسەسفرە؛ چێشتێ کە دراوسێیان بە خۆشەویستیەوە بۆ یەکتری دەنێرن ‹این حلیم کاسەهمسایە است: ئەم حەلیمە کاساوسایە›.

**کاش** / kāš/: شبه‌جمله. خۆزگا؛ خۆزکا؛ خۆزگە؛ خۆزگایا؛ خۆزگایێ؛ خۆزیایا؛ خۆزیایێ؛ خۆزگاری؛ خووزیا؛ خوەزگە؛ خۆزیا؛ خوەزیا؛ خۆزگایەکوو؛ خۆزی؛ خوەزی؛ خۆزە؛ خوزەو؛ بەزە؛ بریا؛ برێ؛ بری؛ بریکەنێ؛ کاشکا؛ های؛ شەلا؛ شەلای؛ یاش؛ یاشا؛ وەشلەی؛ بریکا؛ کاشکای؛ کاشکایە؛ کاشکایەکوو؛ کاشکایەکی؛ کاشکان؛ کاشک؛ کاشکی؛ ئار؛ ئاخ؛ غەزگاڵ؛ وشەیەک بۆ دەربڕینی ئاوات و داخوازی دڵ ‹کاش تو هم می‌دیدی: خۆزگا تۆش دەتبینی›

**:کاشکی**

**کاشالوت** / kāšālot ، ـها/: [از فرانسوی] اسم. ١. کاشالۆت؛ عەنبەرماسی؛ واڵی عەنبەر؛ جۆرێک واڵی ددان ئەستووری سەر زۆر

گەورەی تەڕی لە مۆم و ڕۆن و ڕۆنێکی ڕوون و بۆنخۆش بە ناوی عەنبەر لە زگدا کە عەتری پێ دروست دەکەن: **عنبرماهی؛ نهنگ عنبر**

**کاشانه** / kāšāne ، ـها/: اسم. ١. [ادبی] ماڵ؛ یانە؛ خانووی بەتایبەت چکۆلە ٢. ماڵۆچکە؛ خانووچکە؛ کوخ؛ کۆختە؛ قۆختە؛ کاز؛ ماڵی بچووک و فەقیرانە ٣. وارخان؛ ئاپارتمان.

**کاشت** / kāšt/: اسم. کشت‌وکاڵ؛ کاشت؛ کشت؛ کێڵ؛ کاڵ؛ کار؛ کار و ڕەوتی چاندن؛ ناژتن؛ کێڵان؛ کاشتن؛ نان؛ نیان ‹کاشت امسال خوب بود: ئەوساڵ کشت و کاڵ باش بوو›.

**کاشتن**/ kāštan/: مصدر. متعدی. لازم. //**کاشتی**: چاندت؛ **می کاری**: دەچێنی؛ **بکار**: بچێنە// □ متعدی. ١. چاندن؛ چەندن؛ کاشتن: الف) نیان؛ کێڵان؛ نەژراندن؛ نژاندن؛ نێژتن؛ ناژتن؛ ناشتن؛ نان؛ دابنارتن؛ کاڵەی؛ کالای؛ نیەی؛ نیای؛ چکاندن؛ داچکاندن؛ وەکەردەنە؛ وەشاردنی بنی نەمام لە توی خاک (چاڵێک) و داپۆشانی بە مەبەستی داهاتی کشت‌وکاڵ یان باخەوانی ‹درخت کاشتن: دار نیان› ب) وەشاندن؛ وەشانن؛ شاندن؛ شانای؛ کارتش؛ کارتەن؛ توو کردنە ژێر خاکەوە ‹گندم کاشتن: گەنم وەشاندن›: **کِشتن** [ادبی] ٢. [گفتاری] چەقاندن؛ چەقنەی؛ دانانی شتێک لە جێگایەک بە جۆرێ کە بە خۆوە نەجوولێ ‹تیر را کاشت توی قلبش: تیری چەقاندە نێو دڵیەوە› ٣. [گفتاری] ماتڵ کردن؛ چاوەڕێ کردن؛ دانان ‹کسی را توی خیابان کاشتن: کەسێک لە شەقامدا ماتڵ کردن› □ لازم ٤. [گفتاری] بار هێنان؛ پێ کردن؛ کارێک بە ڕێوە بردن بەتایبەت لە باری چۆنیەتیەوە ‹خیط کاشتن؛ شیرین کاشتن: گەند بار هێنان؛ چاک پی‌کردن› هەروەها: **کاشتنی**

■ صفت فاعلی: **کارنده** (چێنەر)/ صفت مفعولی: **کاشته** (چێندراو)/ مصدر منفی: **نَکاشتن** (نەچاندن)

**کاشف** / kāšef ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] اسم. دۆزەرەوە؛ ئەوەی کە شتێک دەدۆزێتەوە ‹پاستور کاشف میکرُب بود: پاستۆر دۆزەرەوەی میکرۆب بوو›.

▣ **کاشف به عمل آمدن**: دەرکەوتن؛ دیار دان؛ کەوتنە دەرەوە ‹کاشف به عمل آمد که دزد، همسایه‌شان بوده است: دەرکەوت کە دز، جیرانێکیان بووە›.

**کاشکل** / kāškol ، ـها/: [فرانسوی] اسم. ١. بەرمل؛ لەتە پارچەی دووراو بۆ داپۆشانی ژێر مل و بەرسینە ٢. مل‌پێچ؛ چەپەربەن؛ پارچەی درێژۆکەی تایبەتی سەرما و سۆڵە بۆ داپۆشانی سەر و مل.

**کاشکی** / kāškî/: ☜ **کاش**

**کاشه** / kāše ، ـها/: اسم. تویژ؛ تویژاڵ؛ تۆژاڵ؛ توێژاڵک؛ تویک؛ تویخ؛ تووژ؛ تووژک؛ ڕووپەڕێکی ناسک بە سەر شتێکدا.

**کاشی** [1] / kāšî ، ـها/: اسم. کاشی: ١. کاشیە؛ ئاجۆرێ بە ڕووپەڕێک لووس و لەعابدراو، بە نەخش و نیگارەوە بۆ داپۆشان و ڕازاندنەوەی جێگایەک ٢. پلاک؛ ڕووپەڕێکی چکۆلە لە کاشی یان کانزا کە ژمارەی ماڵی بە سەرەوە نووسراوە ٣. ژمارەی ماڵ؛ ژمارەی پلاک.

**کاشی** [2]: صفت. کاشی: ١. پێوەندیدار بە شاری کاشانەوە ٢. خەڵکی کاشان.

**کاشی‌پز** / kāšîpaz/ ☜ **کاشی‌ساز**

**کاشی‌پزی** / kāšîpazî/ ☜ **کاشی‌سازی**

**کاشیچی** / kāšîčî/: [فارسی/ ترکی] ☜ **کاشیگر**

**کاشی‌ساز** / kāšîsāz ، ـها؛ ـان/: اسم. کاشی‌ساز؛ کەسێ کە کاری پێژان و دروست‌کردنی کاشیە: **کاشی‌پز**

**کاشی‌سازی** / kāšîsāzî/: اسم. کاشی‌سازی: ١. کار و ڕەوتی دروست‌کردنی کاشی ٢. /ـها/ کارگای کاشی دروست‌کردن * **کاشی‌پزی**

**کاشیکار** / kāšîkār ، ـها؛ ـان/: اسم. کاشیکار؛ کەسێ کە کاشیکاری دەکا.

**کاشیکاری** / kāšîkārî ، ـها/: اسم. کاشیکاری: ١. کاری داپۆشان و خەملاندنی ڕووپەڕێک بە

کاشی ٢. رووپەڕێک کە بە کاشی داپۆشراوە ‹آشپزخانه تا پای سقف کاشیکاری شده است: ئاشپەزخانە تا بنمیچ کاشیکاری کراوە›.

**کاشیگر** / kāšîgar ، ـها؛ ـان/:/سم. ١. کاشیساز؛ کەسێ کە کاری دروستکردنی کاشیە ٢. کاشیفرۆش؛ کەسێ کە کاری فرۆشتنی کاشیە * **کاشیچی**

**کاغذ** / kāqaz ، ـها/: [از چینی]/سم. کاغەز: ١. تێنووس؛ لاپەڕەیەک زۆرتر لە هەویری هەودای گیایی بۆ لەسەر نووسین ٢. پەڕەیەک کە وەکوو ئەوەیە یان هەر بۆ لەسەر نووسین دەبێ‹ کاغذ مومی: کاغەزی مۆمی› ٣. *[گفتاری]* نامە ‹از وقتی رفته برایمان کاغذ نفرستاده: لەو کاتەوە چووە کاغەزی بۆمان نەنووسیوە›.

◙ **کاغذ آ**: کاغەزی ئا/ A؛ کاغەزی تایبەت بۆ چاپ لە ئەندازەی ٦٠٠ لە ٩٠٠ میلیمیتردا.

**کاغذ آـ٣**: کاغەزی ئاـ٣/ $A_3$؛ کاغەزی لە ئەندازەی ٢٩٧ لە ٤٢٠ میلیمیتردا.

**کاغذ آـ٤**: کاغەزی ئاـ٤/ $A_4$؛ کاغەزی لە ئەندازەی ٢١٠ لە ٢٩٧ میلیمیتردا.

**کاغذ آـ٥**: کاغەزی ئاـ٥/ $A_5$؛ کاغەزی لە ئەندازەی ١٤٨ لە ٢١٠ میلیمیتردا.

**کاغذ آلومینیومی**: کاغەزی ئالمین؛ لاپەڕی یەکجار ناسکی فافۆن بۆ شت تێدا پێچانەوە. هەروەها: **کاغذ قلعی**

**کاغذ ابر و باد/ ابری**: کاغەزی هەور و با؛ کاغەزێک بە نەقش و نیگاری سێبەرئاساوە کە بۆ جواننووسی و لە کاری چاپیشدا بۆ ئاستەری کتێب بە کاری دەبەن.

**کاغذ الوان**: هەر یەکە لە چەشنگەلی کاغەز کە بۆرە و ماکی سپیکەرەوەیان لێنەداوە.

**کاغذ ب**: کاغەزی بێ/ B؛ کاغەزی تایبەت بۆ چاپ بە ماشین چاپی گەورە لە ئەندازەی ٧٠٠ لە ١٠٠٠ میلیمیتردا.

**کاغذ بـ٤**: کاغەزی بێـ٤/ $B_4$؛ کاغەزی ڕەحلی؛ کاغەزی لە ئەندازەی دەوروبەری ٢٣٥ لە ٣٢٠ میلیمیتردا.

**کاغذ بـ٥**: کاغەزی بێـ٥/ $B_5$؛ کاغەزی وەزیری؛ کاغەزی لە ئەندازەی دەوروبەری ١٦٠ لە ٢٣٥ میلیمیتردا.

**کاغذ باطله**: کاغەزە بێکارە؛ کاغەزێ کە جارێ کەلکی لێ گیراوە و چیتر بە کار نایە.

**کاغذ پوستی**: کاغەزی پێستی؛ چەشنێ کاغەزی روون بۆ نەقشەکێشی.

**کاغذ ترانسپارنت**: کاغەزی شیشەیی؛ کاغەزێک کە تیشکی لێوە تێپەڕ دەبێ.

**کاغذ توالت** ☜ **کاغذتوالت**

**کاغذ خرید** ☜ **کاغذخرید**

**کاغذ دو خط**: کاغەزی جووت خەت؛ کاغەزی دوو خەتە؛ کاغەزێکی تایبەت بۆ نووسینی خەتی لاتینی.

**کاغذ روزنامه** ☜ **کاغذ کاهی**

**کاغذ روغنی**: کاغەزی ڕەوغەنی: ١. جۆرێ کاغەزی نیوەماتی ئاو هەڵگر ٢. کاغەزی یەکڕوو ڕەنگکراو و بریقەدراو کە بۆ گوڵسازی و ڕازاندنەوەی شوێنێک دەبێ.

**کاغذ سنباده**: کاغەزسماتە؛ کاغەزپەرداخت؛ کاغەزساو؛ کاغەزێک کە لایەکی بە وردەکانزا یان ماکێکی زبر داپۆشراوە، بۆ ساوین و لووس کردنی رووبەری شتێک دەبێ.

**کاغذ شطرنجی**: کاغەزی چوارماڵ؛ کاغەزی شەترەنجی.

**کاغذ کادو** ☜ **کاغذخرید**

**کاغذ کاربن**: کاغەزکاربون؛ کاغەزی روویەک بە مۆمی ڕەنگی داپۆشراو لە نێوان دوو یا چەند پەڕەی کاغەزی دەنێن، هەر چی لە سەر پەڕەی یەکەم بنووسرێ، دەچێتە سەر پەڕەکانی ژێروو.

**کاغذ کالک**: کاغەزی کالک؛ کاغەزێکی هێندێک ئەستوور و نیوە ماتە بۆ ڕەسم و

نەخشە لە سەر کێشان دەبێ.
کاغذ کاهی: کاغەزی کایی؛ کاغـەزی لـە گـژ وگیا و کاغەزە بێکارە دروستکـراو بـۆ چـاپی ڕۆژنامە و کتێبی هەرزانبایی: **کاغذ روزنامە**
کاغـذ گلاسـە: کاغـەزی گلاسـە؛ کاغـەزی هەرەباشی بریقەدار بۆ چاپی ڕەنگی.
▣ **کاغذ دادن:** *[کنایی]* نامە نـاردن؛ کاغـەز دان؛ کاغەز نویستەی ‹پدرم کاغذ دادە کـە مـیخواهـد بیایـد دیـدنمان: بـابم نامـەی نـاردووە کـە دێ بـۆ بینینمان›.
کاغـذ سـیاە کـردن: *[تعـریض]* کاغـەز ڕەش کردنـەوە؛ نووسـین ‹صبح تـا شـب کاغـذ سـیاە مـیکنی کە چە بشـود؟: بـەیانی تـا درنگـان کاغـەز ڕەش دەکەیەوە کە چی؟›.
کاغـذ فـدایت شـوم فرسـتادن/ نوشـتن ☜ **نامەی فدایت شوم فرستادن/ نوشتن**
روی کاغـذ آوردن: هێنانـە سـەر کاغـەز؛ نووسین ‹آنچە را کـە مـیگـویی روی کاغـذ بیـاور: ئەوەی کە دەیڵێی بیهێنە سەر کاغەز›.

**کاغذبازی** / kāqazbāzî ، ـها/: [از چینـی/ فارسـی] *اسم. [کنایی]* ئیدارەبازی؛ زێدەڕۆیی لە کار و باری ئیداریدا کە هۆی درەنـگکـەوتنی کارانـە ‹بایـد کاری کرد کە این کاغذبازی کم بشود تا مردم بە کارشان برسند: ئەبێ کارێک بکرێ کە ئـەم ئیدارەبازیـە کـەم ببێتەوە تا خەڵک بە کار و باریان ڕابگەن›.

**کاغذبر** / kāqazbor ، ـها/: [از چینی/ فارسی] *اسم.* کاغەزبڕ: ١. چەشنێ کاردی تیژ بـۆ کردنـەوەی سەری پاکەت ٢. ماشینی کاغەز بڕین.

**کاغذپارە** / kāqazpāre ، ـها/: [از چینـی/ فارسـی] *اسم.* کاغەزەشـڕە؛ کوتەکاغـەز؛ شـڕەکاغەز: ١. کاغەزی شڕ و دڕاو ‹روزهای انتخابات خیابان پـر شدە بود از کاغذپارە: ڕۆژانی هەڵبژاردن شەقامەکان پڕ بـوون لـە کاغەزەشڕە› ٢. پارچەکاغـەزێ لـە لاپەڕەیەک ‹روی یک کاغذپارە یادداشت کن: لە سەر کوتەکاغەزێک بینووسە› ٣. *[مجازی]* نووسـراوەی کەمبایەخ ‹هر کس یک کاغذپارە مینویسد و میشـود نویسندە: هەر کەسێک کاغەزەشڕەیەک دەنووسـێ و دەبێتە نووسەر›.

**کاغذپرانی** / kāqazparānî/: [از چینـی/ فارسـی] ☜ **نامەپرانی**

**کاغذتوالت** / kāqaztovālet, -tûvālet ، ـها/: [از چینی/ فرانسوی] *اسم.* دەسماڵی دەسـاو؛ چەشـنێ دەسماڵی کاغەزی کە لـە دەسـاودا خـۆی پـێ دەسڕن یان وشکی دەکەنەوە.

**کاغذخریـد** / kāqazxarîd ، ـهـا/: [از چینـی/ فارسی] *اسم.* فاکتور؛ لاپەڕەیەکی زۆرتر چاپی کـە کاتی سەندنی کاڵایەک بە کڕیار دەدرێ و تێـدا ناو و نرخی کاڵاکە نووسراوە.

**کاغـذدیواری** / kāqazdîvārî ، ـها/: [از چینـی/ فارسی] *اسم.* کاغەزیدیـواری؛ جۆرێـک کاغـەزی هێندێک ئەستووری بە نـەخش و نیگـارەوە بـۆ داپۆشین و جوانکردنی دیوار.

**کاغذسازی** / kāqazsāzî/: [از چینی/ فارسی] *اسم.* کاغەزسازی: ١. /ـها/ کارخانەی دروستکـردنی کاغەز ‹دو ماە است منتظریم کاغذسازی بـە مـا کاغـذ بدهـد: دوو مانگـە ماتڵـین کاغەزسـازی کاغـەزمان بداتێ› ٢. کار و ڕەوتی دروسـتکـردنی کاغـەز ‹کاغذسازی بە صورت امروزی در چین ابداع شدە است: کاغەزسـازی بـەم شـێوە نوێیـە لـە چینـەوە بـەدی هاتووە› ٣. *[گفتاری]* بەڵگە هەڵبەستن؛ دروسـت کردنی بەڵگە و نامەی درۆینە.

**کاغـــذکادو** / kāqazkādo ، ـهـا/: [از چینـــی/ فرانسـوی] *اسـم.* کاغـەزکادۆ؛ کاغـەزی گـەورەی نـەخش و نیگـار لـە سـەر چاپکـراو بـۆ تێـدا پێچانەوە و ڕازاندنەوەی دیاری.

**کاغـذگیر** / kāqazgîr ، ـها/: [از چینـی/ فارسـی] *اسم.* کاغەزگر؛ گیرەیـەکی لـە چێـو یـان کـانزا، کـاتی نووسـین سـەری کاغەزەکـەی لـە سـەر ڕووپەڕێک پێ گیر دەدەن نەجووڵێ.

**کاغذ و تا** / kāqaz-o-tā/: [از چینی/ فارسی] *اسم.*

هونەری دروست‌کردنی بیچمی گیانەوەران یان شتی‌تر بە دەق‌کردنی کاغەز (وەک کەشتی، کلاو، مریشک و...): **اُریگامی**

**کاغــذی** / kāqazî ، ـهـا/: [از چینــی] *صـفت*. ۱. کاغەزی؛ کاغەزین؛ لە چەشنی کاغـەز ‹کلاه کاغذی: کـلاوی کاغـەزی› ۲. *[مجازی]* پووشـەڵ؛ پووشـین؛ بـێ‌بەرگـە ‹خانـەی کاغـذی: ماڵـی پووشەڵ›.

**کاغیــدن** / kāqîdan/: *مصـدر. لازم. [قـدیمی]* قڕانـدن؛ قیڕانـدن؛ قیـڕانن؛ قیڕنـەی؛ قڕنـەی؛ قڕنای؛ قاڵ‌کردنی قالاو.

**کاف** / kāf/: [عربی] /*سم*. کـاف؛ نێـوی عـەرەبی بیست‌وپێنجەمین پیتی ئـەلف‌وبێتکـەی زمـانی فارسی.

**کــافئین** / kāfe'în/: [فرانسـوی] /*سـم. [شـیمی]* کافێین؛ ماکێکی کیمیایی ئەهوەن‌کەرەوەیە لە دەنکی قاوە و گەڵای چایدا هەیە.

**کــافتن** / kāftan/: *مصـدر. متعـدی. [قـدیمی]* ۱. قەڵشاندن؛ قەڵاشتن؛ کەڵاشـتن؛ تلیشـاندن؛ دەرزانـدن؛ شـکاوای ۲. قۆقڵانـدن؛ کون (تێ)کردن؛ وڵەکەردەی.

**کافر**[1] / kāfar, kāfer ، ـها؛ ـان؛ کُفّار/: [عربـی] /*سم*. کافر: ۱. خوانەناس؛ بێ‌دین؛ کەسێ کە دینێکی ڕاستەقینەی نیە ۲. کەسێ کە موسوڵـمان نیـە ۳. کەسێ کە بە ڕاستەقینەیەک دەزانـێ بـەڵام پشتی لێ دەکا.

**کافر**[2]: *صفت*. ۱. خوانەناس؛ بـێ‌ئـۆل؛ بـێ‌دیـن؛ بێ‌ئایین؛ کافر؛ دینسز؛ دیندڕ؛ زندق؛ بێ‌بـڕوا بـە خوا ۲. سپڵە؛ پێ‌نەزان.

**کــافرکیش** / kāfarkîš, kāfer- ، ـان/: [عربـی/ فارسی] *صفت*. ۱. ناموسڵمان؛ بڕوامەند بـە دینـێ جگە لە ئیسلام ۲. بێ‌دین.

**کافری** / kāfarî, kāferî/: [عربـی] /*سم*. کـافری؛ دۆخ یان چۆنیەتی کافر بوون.

**کافشه** / kāfše/ ☜ گل رنگ ـ۱، **گل**

**کافور** / kāfûr/: [معرب از سنسـکریت] /*سم*. کافوور؛ کاپوور: ۱. داری کافوور؛ ناوی دوو جۆر دارە کە نـاو قـەدیان دەقەڵشـێنن و مـاکی کافووریـان لێ‌دەگرن ۲. ماکێکی سپی بە بۆنێکی تایبەتەوە کە زوو گـڕ دەگـرێ و هێنـدێک ژەهریـە و لـە بژیشکی و پیشەسازیدا زۆر کەڵکی هەیە: **کامفر**

**کــافوری**[1] / kāfûrî/: [معـرب] /*سـم*. کـافووری؛ کاپووری؛ ڕەنگی سپی بێ‌خەوش.

**کــافوری**[2]: *صفت*. کـافووری؛ کـاپووری: ۱. بـە ڕەنگی سپی بێ‌خەوش ۲. دروستکراو لە کافوور یان پێکهاتەکانی.

**کافه** / kāfe ، ـها/: [فرانسوی] /*سم*. ۱. خواردنگـە؛ خوارنگەهـ ؛ ئاشـخانە؛ چێشـتخانە ۲. چاخانـە؛ چایخانە؛ قاوەخانە ۳. شیرینی‌خانە؛ قەنادی.

**کافـه‌تریـا** / kāfeteryā ، ـهـا/: [فرانسـوی] /*سم*. قاوەخانە؛ چاخانە؛ چایخانە؛ جێگایەک کە مێز و سەندەڵی یان کەت و کورسی لێ دانراوە و چای و قـاوە و شـەربەت و ئـابمیوە و شـیرینی و بەسـتەنی هەیـە، مشـتەری دادەنیشـێ و هەرچێکی پێ خۆش بوو بخـوا یـان بخواتـەوە، داوا دەکا، بۆی دێنن: **تریا**

**کافه‌چی** / kāfečî ، ـهـا/: [فرانسـوی/ ترکـی] /*سم*. قاوەچی؛ چایچی؛ خاوەنی چاخانە.

**کافه‌رستوران** / kāferestûrān ، ـها/: [فرانسـوی] /*سم*. خواردنگە؛ خوارنگەهـ ؛ ئاشخانە؛ چێشتخانە.

**کافه‌قنـادی** / kāfeqannādî ، ـهـا/: [فرانسـوی/ از عربـی] /*سم*. شـیرینی‌خانـە؛ شـرینی‌فرۆشـی؛ دووکـانێکی شـیرینی فرۆشـی کـە جێگـای بـۆ دانیشـتن و خـواردنی شـیرینی و بەسـتەنی و شتی‌تر هەیە.

**کافـه‌گلاسـه** / kāfeg(e)lāse/: [فرانسـوی] /*سم*. کافەگلاسە؛ چەشنێ خواردنەوە کـە بـە شـیر و بەستەنی و قاوە دروست دەبێ.

**کافـه‌نشـین** / kāfenešîn ، ـها؛ ـان/: [فرانسـوی/ فارسی] *صفت*. قاوەخانەیی؛ خاوەن هـۆگرەتی بـە

بوون و مانەوە لە قاوەخانەدا.

**کافی** / kāfî/: [عربی] صفت. بەس؛ بەسندە؛ بەسنە: ١. بە ئەندازە؛ سەر و مڕ؛ تەواو؛ سەر و زیاد؛ یەزی؛ بڕ؛ بە چەندیەتی، چۆنیەتی یان هەندێ بۆ بەجێهێنانی داخواز ‹پول کافی: پارچەی کافی: پارەی بە ئەندازە؛ پارچەی سەر و مڕ› ٢. [ادبی] شیاو؛ لێهاتوو.

**کافی‌شاپ** / kāfîšāp ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. کافی‌شاپ؛ دووکانێ کە تێیدا قاوە، چای و خواردنەوەی گەرمی‌تر بە مشتەری دەدرێ.

**کافی‌نت** / kāfînet/: [انگلیسی]/اسم. کافی‌نێت؛ دووکان و دامەزراوەیێ کە هەلی کەڵک وەرگرتن لە تۆڕی ئینترنێت بۆ مشتەری تەیار دەکا.

**کاک** / kāk ، ـها/:/اسم. کاک؛ چەشنێ شیرینی کە هەویرەکەی بە ڕۆن، هێلکە و ماکی بۆنخۆش دروست دەکەن، ئەمجار هەویرەکە زۆر ناسک دەکەنەوە و خاکەقەندی پێدا دەپڕژێنن و لوولی دەدەن، پاشان دەیبڕن و لە کوورەدا دەیبرژێنن. ئەم شیرینیە سەوقاتی کرماشانە.

**کاکا** / kākā ، ـها/: [از کردی]/اسم. [گفتاری] کاکە؛ کا؛ ئابرا ‹کاکا آزاد: کاکە ئازاد›.

**کاکائو** / kākā'û/: [فرانسوی]/اسم. کاکائوو؛ کاکاهوو: ١. /ـها/ دارێکی کورتەبالای گەڵاپانی گوڵ مەیلەو سووری بێبۆنە، میوەیەکی هێلکەئاسای بە ڕەنگی زەرد یان سووری هەیە ٢. تۆمی ئەو دارە کە قاوەیی مەیلەو سوورە و دەوری دوو ـ سێ سانتی‌میتر درێژە و بۆ دروست کردنی هەموو جۆرە شیرینی و شوکولاتی کاکاهوویی بە کار دەچێ ٣. پوودری بۆدراوی ئەو تۆمە کە دەمی دەکەن یان لەگەڵ شیر دەیکولێنن و دەیخۆنەوە ٤. شوکولات؛ چاکلێت.

**کاکائویی** / kākā'ûyî/: [فرانسوی] صفت. کاکائوویی؛ کاکاهوویی؛ تێکەڵ بە کاکائوو ‹بستنی کاکائویی: بەستەنی کاکائوویی›.

**کاکاسیاه** / kākāsiyā(h) ، ـها/:/اسم. [تعریض] قول؛ قولڕەش؛ قەلەڕەشە؛ قولەڕەشە؛ ڕەش‌پێست ‹یک کاکاسیاه را گرفته بودند، میزدند: قولێکیان گرتبوو، لێیان دەدا›.

**کاکتوس** / kāktûs/: [فرانسوی]/اسم. کاکتووس: ١. تاقمێک گیای خۆڕسکی ناوچەیی ئەمریکا یان ڕازێنەیی، بە ساقەتە و گەڵای ئەستوور و دڕکاوی ئاودارەوە کە زۆرتریان گوڵی درشت و جوان و میوەی وەک هەنجیریان هەیە ٢. /ـها/ هەموو جۆرە ڕووەکی دڕکاوی و گۆشتنی ڕازێنەیی.

**کاکل** / kākol/:/اسم. پۆپ؛ پۆپە؛ کاکۆڵ؛ قاقول؛ کاکل؛ کاکول؛ کاکوڵ: ١. تەنبووری؛ بژ؛ تونجک؛ توالێت؛ خولامانە؛ خولامانێ؛ کولی؛ پۆپرە؛ پۆڕ؛ جاخ؛ گودلە؛ گۆدیلە؛ فلکە؛ فەکلە؛ کوودلە؛ کوودیلە؛ تانجۆکە؛ مووی درێژی ناوەڕاست و پێشەوەی سەر ٢. ڕیشۆڵ؛ هەر شتێکی وەکوو ئەوە ‹کاکل ذرت: پۆپەی گەنمەشامی›.

**کاکل‌زری** / kākolzarî/: صفت. [گفتاری] کاکۆڵ‌زەرد؛ کاکوڵ‌تلەین؛ قژزەرد؛ بە مووی زەردی وەک تەلاوە.

**کاکلی** [1] / kākolî ، ـها/:/اسم. کلاونە؛ کلاوکوورە؛ کلاوکورە؛ کلاوەکووڕ؛ فشەکلاوە؛ چوڕەپۆپنەکێ؛ چۆڕپۆپنە؛ سۆفەقێتە؛ سۆفیەقیتە؛ سۆفیلکە؛ چەشنێ پەلەوەری پۆپە بەرز، دەندووک قوت و چەماوە، کە مێروو دەخوا و هێلانەی لە سەر زەوی لە موو، خوری یان پەڕ ساز دەکا.

**کاکلی** [2]: صفت. [گفتاری] پۆپن؛ پۆپنی؛ پۆپنە؛ پۆپەیی؛ پرچن؛ کاکۆڵی؛ خاوەن پۆپە ‹مرغ کاکلی: مریشکی پۆپن›.

**کاکنج** / kākenac ، ـها/:/اسم. کاکنەج؛ کێکنجی؛ بزگیلە؛ گەزۆکە؛ تەماتەجنانێ؛ گوڵەقەدیفە؛ ئالفەگیایەکی خۆڕسکە بۆ دەرمان دەشێ،

میوەیەکی سووری وەک بەلالووکی هەیە: **عروسک پس‌پرده؛ کاکنه**

**کاکنه** / kākene/ ☜ **کاکِنَج**

**کاکوتی** / kākûtî ، ـها/: [از ترکی]/اسم. مشک تەرامشیح؛ جاترەکێویلە؛ هەزبیەکێفیلە؛ هەزبۆکێفیلە؛ هەزوەکیفی؛ چاییە شاخی؛ گیایەکی ئالیکی یەکسالان، بە گەلای بۆنخۆش، باریک و نووک‌تیژ و گوڵی بنەوەشەوە کە لە کاتی بەهاردا لە زیخەڵان دەڕوێ، بە کاڵی دەخورێ و دەناو چێشتیش دەکرێ.

**کال** / kāl/: صفت. کاڵ؛ کال؛ کار؛ کنج؛ کرچ؛ خرچ؛ کۆڵنج؛ کارک؛ خاو؛ کەسی؛ نەگەیشتوو؛ فرتە؛ نەڕەسی؛ نەگها؛ سوە؛ بەبێ گەشەی پێویستەوە ‹میوەی کال: میوەی کاڵ›. بەرانبەر: **رسیده**

◙ **کال-کال:** *[گفتاری]* کرچ و کاڵ؛ بە کاڵی.

**کالا** / kālā ، ـها/: اسم. کالا؛ پیتەوا؛ کالەر؛ بابەت؛ ماڵ؛ متا؛ مەتا: ١. ئەوەی کە بۆ کڕین و فرۆشتن بشێ ٢. ئەوەی کە بۆ فرۆش دانراوە یان داواکراوە.

**کالابرگ** / kālābarg ، ـها/: اسم. کوپون؛ پەڕەیەکی تایبەت بۆ دەست خستنی کالایەکی پێویست بە نرخێکی هەرزان‌تر لە بازاڕ.

**کالانما** / kālānemā/ ☜ **کاتالگ**

**کالباس** / kālbās/: [روسی]/اسم. زونگ؛ زوونگ؛ باستورمە؛ باسترمە؛ کالباس؛ تێکەڵێک لە گۆشت و چەوری و بەهارات و... کە دوای چەرخ‌کردن، دە کیسەیەکی ناسک ئاخنراوە و کوڵاوە.

**کالبد** / kālbod, kālbad ، ـها/: [از یونانی]/اسم. ١. کەلەستە؛ کەلەخ؛ کلۆخ؛ یۆرت؛ بەدەن؛ قالب؛ قالب؛ قەوارە؛ قەلافەت؛ بەشەن؛ ئابیدە؛ تەن؛ لەش؛ لاشە؛ لەخت؛ پێکهاتەی دەرەوەی جەستەی گیانەوەران بریتی لە پێست و گۆشتێک کە ئێسک ڕایگرتووە ٢. تێکوڵ؛ تۆکڵ؛ قاپلۆخ؛ قاپیلکە؛ قاپ؛ قلاپیک؛ پێکهاتەی دەرەکی جەستەی بڕێ لە گیانەوەران، بەتایبەت مێروو کە ماکێکی ڕەقە و ئەندامانی نەرم و ناسکی داپۆشیوە ٣. چوارچێوە؛ پێکهاتەی سەرەکی بەدیهێنەری هەر ئامێرێک ‹کالبد خانە: چوارچێوەی ماڵ› ٤. چوارچێوە؛ پەیکەر؛ بنەڕەتی سەرەکی ئاسەوارێکی هونەری و وێژەیی ‹کالبد داستان: چوارچێوەی چیرۆک›.

**کالبدشکافی** / kālbodšekāfî/: [از یونانی/ فارسی] اسم. *[پزشکی]* توێکاری؛ لەشکاوی؛ کار و ڕەوتی: ١.جیاکردنەوەی شانگەلی لاشەی گیانەوەران بۆ لێکۆڵینەوە و زانینی زۆرتر ٢. دەرهێنان و تۆژینەوە لە سەر ئەندامانی لەشی مردوو، بۆ دۆزینەوە هۆی مردن.

**کالبدشناسی** / kālbodšenāsî/: [از یونانی/ فارسی] اسم. *[پزشکی]* لەش‌ناسی؛ زانستی لێکدانەوەی جەستەی گیانەوەران و چۆنیەتی پێوەندی پاژگەلی جیاوازیان پێکەوە، کە بە لەشکاوی ئەنجام دەدرێ.

**کالبدگشایی** / kālbodgošāyî/: [از یونانی/ فارسی]/اسم. *[پزشکی]* لەشکاوی؛ پشکنینی ئەندامانی تەرم بۆ زانینی هۆکاری مەرگ.

**کالج** / kālec ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ١. زانکۆ؛ بەشێکی تایبەت لە زانستگە ٢. قوتابخانەی دواناوەندی (پێش زانستگا) ٣. قوتابخانەی شەوانەڕۆژی.

**کالجوش** / kāl(e)cûš/:/اسم. کایلۆش؛ شێوی کەشکی تراو، کاکڵە، نەعناداخ یان پیازداخ کە نانی تێدەکوشن: **کله‌جوش**

**کالری** / kālorî/: [فرانسوی]/اسم. کالوری: ١. *[فیزیک]* یەکەی پێوانی گەرما بەرانبەر بە ڕادەیەک لە گەرما کە گرەمێک ئاو یەک دەرەجەی سانتیگراد گەرمتر بکاتەوە ٢. *[زیست‌شناسی]* گەرما، تین یان هێزی بەدیهاتوو بە بۆنەی خواردنی خواردەمەنی لە

لەشدا ٣. ئەو ڕادە لە هەر خواردەمەنیەک کە یەک کالوری تین، گەرما یان هێز بەدی بێنێ.

**کالریمتر** / kālorîmetr ، هـا/: [فرانسوی]/اسم. گەرماپێو.

**کالسکه** / kāleske, kālesge ، ـها/: [روسی]/اسم. فایتوون؛ پێتوون؛ کالیسکە؛ گالیسکە؛ عارەبانەی سەر داپۆشراوی چوارچەرخ کە بە یەک یان چەند ئەسپ دەیکێشرێ و مسافری پێ دەبەن.

▣ **کالسکەی بچە**: کالیسکەی منداڵ؛ عارەبانەیەکی چوارچەرخی چکۆلە بۆ زارۆکان کە دەستەیەکی بۆ ڕاگواستنەوە هەیە.

**کالسکه‌ران** / kāleskerān, kālesge- ، ـها؛ ـان/: [روسی/ فارسی]/اسم. کالیسکەچی؛ کالیسکەئاژۆ؛ لێخوڕی فایتوون.

**کالسیم** / kālsiyom/: [فرانسوی] ☜ **کلسیم**

**کالک** / kālak/:/اسم. زڕکە؛ زرک؛ زرکە؛ زرگ؛ کاڵەکی نەگەییو.

**کالک** / kālk/ ☜ کاغذ کالک، **کاغذ**

**کالنبار** / kālambār, kālanbār ، ـها/:/اسم. مەڕەگ؛ ناوچە یان شوێنی ئازادی بازرگانی کە پیتەوا لەوێوە بۆ جێگای‌تر بار دەکرێ.

**کالونیسم** / kālvanîsm/: [فرانسوی]/اسم. کالوەنیسم؛ ئایینێکی مەسیحی پروتستانە کە ژان کالوەن (١٥٠٩-١٥٦٤ زایینی) دایمەزراند: **کالوینیسم**

**کالوینیسم** / kālvînîsm/: [فرانسوی] ☜ **کالونیسم**

**کالیبر** / kālîbr ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کالیبر: ١. کۆتەرەی ناوەوەی لوولەی چەک ٢. کۆتەرەی ناوەکی هەر تەنێکی گرۆڤەری ناوبەتاڵ.

**کالیدن** / kālîdan/: مصدر. لازم. [قدیمی] ١. شێوان؛ شێویان؛ شپرزان؛ شپریوان؛ تێکچوون؛ شێویای؛ شیویەی؛ پەشۆکان؛ پەشۆکیان؛ پەشێویەی؛ پەرێشان بوون ٢. هەڵاتن؛ دەرچوون؛ بەرشیەی.

**کالیفرنیم** / kālîforniyom/: [انگلیسی]/اسم. کالیفورنیوم؛ تۆخمی کیمیاوی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ لە دەستەی ئاکتینیدەکان بە ژمارەی ئەتومی ٩٨ و ڕەنگی خۆڵەمێشی کە لە بومباردمانی کوریوم بەرهەم دێ.

**کالیو** / kālîv ، ـها/: *صفت*. دەبەنگ؛ خاوەن بەشی هۆشی کەم و لە بواری ئاوەزەوە هەر وەک مندالی سێ تا حەوت‌ساڵان.

**کام** / kām ، ـها/:/اسم. ١. مەلاشۆ؛ مەلاشک؛ مەلاژ؛ ئاسمانەی دەم ٢. *[ادبی]* زار؛ دەم؛ دم؛ دەڤ ‹لختی زبان در کام گیر!: ساتێک زمانت لە زاردا ڕاگرە!› ٣. *[ادبی]* زار؛ گەپە؛ گەروو؛ قوڕی؛ قوڕگ؛ نێو شتێکی پڕمەترسی ‹کام دریا؛ کام اژدها: گەرووی زەریا؛ زاری هەژدیها› ٤. ئاوات؛ ئارەزوو ‹کام دل: ئاواتی دڵ› ٥. *[مجازی]* کونێکی ڕێک دەرهاتوو لە سەر تەختەیەک بۆ تێوەچوونی زمانەی تەختەیەکی تر ٦. جێ کلۆم ٧. *[گفتاری]* مژ؛ مۆف.

▣ **کام استخوانی**: *[کالبدشناسی]* سەختە؛ مەلاشوو؛ ئێسکەمەلاژ؛ سەختەمەلاژ؛ ڕەقەمەلاژ؛ بەشی بەرەوەی مەلاژگ کە لە دوو لەتە ئێسک بە ناوی ئێسکی مەلاژ پێکهاتووە.

کام دل: کامی دڵ؛ ئاواتی دڵ؛ خواستی دل.

▣ **کام دادن**: ١. ئاوات/ حەز هێنانە دی؛ خواست و ئاواتێک بەجێ‌هێنان ٢. مەیل دان؛ نەرم بوون؛ داخوازی پیاوێک بۆ دەستەوملان بوون پەزێران. هەروەها: **کام گرفتن**

**کام کسی شیرین شدن**: دڵی کەسێک تێراو بوون؛ بە هۆی بەدیهاتنی ئاواتەوە، خۆشحاڵ بوون.

**بە کام چیزی رفتن**: چوونە زار/ گەروو/ قوڕگی شتێکەوە؛ چوونە نێو شتێک (وەک ئەشکەوت، دەریا، ...) یان زاری گیانەوەرێ

(وەک شێر یان نەهەنگ، ...). هەروەها: **بە کام کشیدن**

**بە کام دل رسیدن:** بە ئاوات گەیشتن؛ بە ئارەزووی دڵ گەیشتن؛ بەجێ هاتنی ئاوات.

**بە کام کسی بودن:** بە دڵی کەسێک بوون؛ باو دڵ کەسێ بوون؛ هاوڕێ لەگەڵ ئاواتدا بوون.

**کامبخش** / kāmbaxš/: *صفت. [ادبی]* بەجێهێنەری ئاواتی دیتران. هەروەها: **کامبخشی**

**کامبرین** / kāmberyan/: [فرانسوی] *اسم.* کامبریەن؛ یەکەم دەورە لە دەورانی یەکەمی زەوی ناسی کە دەبێتە ٥٦٤ تا ٥٠٠ ملیۆن ساڵی پێش.

**کامپیوتر** / kāmpiyoter, kāmpiyûter، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* خێراکار؛ کەمپیوتر؛ دەزگایەکی ئیلکترۆنیکی کە بۆی دەبێ بەرنامەڕێژی لە سەر بکرێ و زانیاری لە سەر هەڵگیرێ و تەنانەت ماشین و دەزگای‌تری پێ بەڕێوە بچێ.

**کامپیوتری** / kāmpiyoterî, kāmpiyûterî/: [انگلیسی] *صفت.* کەمپیۆتری: ١. پێوەندیدار یان سەر بە خێراکارەوە ‹کتاب کامپیوتری: کتێبی کامپیۆتری› ٢. ئامادەکراو بە کەمپیۆترەوە ‹نقشه‌های کامپیوتری: نەخشەگەلی کەمپیوتری›.

**کامجو** / kāmcû، ـیان/: *صفت. [ادبی]* کامەرانی‌خواز؛ خوازیاری بەدیهاتنی ئاواتی دڵ. هەروەها: **کامجویی**

**کامرانی** / kāmrānî، ـها/: *اسم. [ادبی]* کامەرانی؛ بەختیاری؛ کامڕەوایی؛ وەشبەری؛ ڕەوتی بەسەر بردنی ژیان بە دڵخوازی. هەروەها: **کامران**

**کامروا** / kāmravā، ـیان/: *صفت. [ادبی]* کامەران؛ کامران؛ کامڕان؛ بەختیار؛ بە ئاوات‌گەیشتوو. هەروەها: **کامروایی**

**کامفر** / kāmfr/: [؟] ☜ **کافور ـ ٢**

**کامکار** / kāmkār/: *صفت. [ادبی]* کامیار؛ کامەران؛ بەختەوەر؛ خۆشبەخت و سەرکەوتوو لە بەدیهێنانی ئاواتی خۆ. هەروەها: **کامکاری**

**کامل** / kāmel/: [عربی] *صفت.* تەواو؛ تەمام: ١. ساز؛ چاک؛ دروست؛ بێ‌کەم و کووڕی؛ بێ‌کەمایەسی ‹این کتاب کامل است؛ پول خانه کامل شد: ئەم کتێبە تەواوە؛ پارەی ماڵەکە ساز بوو› ٢. خاوەن هەموو تایبەتمەندیگەلی پێویست ‹انسان کامل: مرۆی تەواو›.

**کاملاً** / kāmelan/: [عربی] *قید.* تەواو؛ بە تەواوی؛ بە تواوی؛ بێ زیا و کەم؛ سەر و بەر؛ سەر لە بەر؛ بە دروستی؛ هەمووکی؛ تەمامی؛ تەواوی؛ سپ؛ یەکجێ؛ بێ‌کەم و کووڕی ‹کاملاً فهمیدم؛ کاملاً درست شد: بە تەواوی تێگەیشتم؛ تەواو دروست بوو›.

**کامل‌عیار** / kāmel'ayār/: [عربی] *صفت.* ١. *[فلزات]* بێ‌خەوش؛ تەواوعەیار ‹طلای کامل عیار: زێڕی بێ‌خەوش› ٢. *[مجازی]* پوخت؛ تەواو؛ تواو؛ بە تەواوی تایبەتمەندیگەلی پێویستەوە ‹مرد کامل‌عیار: پیاوی پوخت›.

**کامل‌مرد** / kāmelmard/: [عربی/ فارسی] *اسم. [گفتاری]* کامڵ؛ پیاوی ساڵ بە سەرداچووی بە ئەزموون.

**کامله‌زن** / kāmelezan/: [عربی/ فارسی] *اسم. [گفتاری]* کامڵ؛ ژنی ساڵ بە سەرداچووی بە ئەزموون.

**کاملیا** / kāmel(i)yā، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* کاملیا: ١. دارچکی هەمیشە شینی گەڵا سەوزی تۆخ و بریقەدار ٢. گوڵی درشت و جوانی ئەو دارچکە، بە ڕەنگی سپی و پەمەیی کە سەرەتای بەهار دەم دەکاتەوە.

**کاموا** / kāmvā/: [فرانسوی] *اسم.* کاموا؛ بەنی چەندلۆی ڕێسراو بە ماشین، لە پەموو، خوری یان هەودای دەسکرد.

**کاموا‌باف** / kāmvābāf، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* کامواچن؛ کەسێ کە پیشەی چنینی کاموایە.

**کاموابافی** / kāmvābāfî/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.*

کـاموا‌چنی: ١. کـاری چنـینی گـنج لـه کـاموا ‹ماشین کاموابافی: ماشـینی کـاموا‌چنی› ٢. ـه‌ا/ کارخانه یان کارگایه‌ک که جل‌وبه‌رگی کـاموایی تێـدا ده‌چـنن ‹در کاموابـافی کـار مـی‌کـرد: لـه کاموا‌چنیدا کاری ده‌کرد›.

**کاموایی** / kāmvāyî/: [فرانسوی] *صفت*. کاموایی؛ کامووه‌یین؛ چنراو له کاموا ‹بلوز کاموایی: چاکـه‌تی کاموایی›.

**کامیــاب** / kāmyāb/: *صـفت. [ادبـی]* کامـڕه‌وا؛ کامـه‌ران؛ بـه‌رخوردار؛ مرادحاسـڵ؛ بـه ئـاره‌زوو گه‌یشتوو ‹سرانجام در ازدواج کامیاب شد: ئـاخری لـه ژن هێناندا کامڕه‌وا بوو›. هه‌روه‌ها: **کامیابی**

**کــامیون** / kām(i)yon, kām(i)yûn ، ـهـا/: [فرانسوی]/*اسم*. لۆری؛ کامیون؛ ماشینی بـارکێش بـۆ ڕاگـوێزانی بـاری زۆرتـر لـه ٥ تـون (٥٠٠٠ کیلۆگرەم).

**کامیونت** / kām(i)yonet ، ـها/: [فرانسـوی]/*اسم*. کامیونێت؛ ماشینی باری بچووکتر له کـامیون و گه‌وره‌تر له وانیت به بارستایی زۆرتر له ٢ تون و که‌متر له ٥ تون.

**کان** / kān ، ـها/: [کردی] *اسم. [ادبی]* کان؛ کانگـا؛ مه‌ڵبه‌ن؛ جان؛ مه‌عده‌ن؛ جێگایه‌ک که شتی بـه فراوانی تێدا پـه‌یـدا ده‌بـێ ‹کـان طـلا؛ کـان نقـره: کانـی زێڕ؛ کانگای زیو›.

**کانا** / kānā ، ـها/: *صفت. [قدیمی]* ده‌به‌نگ؛ حـۆل؛ گێژ؛ گێل؛ گێلۆکه؛ خاوه‌ن به‌شی هۆشی کـه‌م و بیری کورت.

**کاناپه** / kānāpe ، ـهـا/: [فرانسـوی]/*اسم*. قه‌نه‌فـه؛ کاناپه: ١. کورسیه‌ک که ژێر و پشتی دۆشـه‌کی هه‌یه ٢. ئه‌سکه‌ملی نرم که جێ دانیشـتنه‌که‌ی دۆشه‌کی هه‌یه.

**کانـال** / kānāl ، ـهـا/: [فرانسـوی]/*اسـم*. کانـال: ١. نۆکـه‌ن؛ نۆکه‌نـد؛ نوکه‌نـد؛ که‌نـداو؛ کرتـاڵ؛ دڕگـه؛ دڕنـاڵ؛ جۆگـه؛ جـۆ؛ جۆلـه؛ جۆگه‌لـه؛ جێگای ده‌سـکرد بـۆ ڕۆشـتنی ئـاو ٢. که‌نـداو؛ ڕه‌هه‌ند؛ ئاوه‌ڕا؛ ئاوه‌ڕۆ؛ دڕناڵ؛ گـڕناڵ؛ که‌ندالـی ده‌سکرد له نێوان دوو چه‌م یان دوو زه‌ریـادا بـۆ هات‌وچۆی که‌شتی ٣. شه‌به‌که ‹کانال ٥ تلویزیون: شـه‌به‌که‌ی ٥ی ته‌له‌ڤـیزیون› ٤. لوولـه‌ی زۆرتـر چوارپاڵوو بۆ ڕاگواستنی هه‌وا ‹کانال کولر: کانالـی کوولیر› ٥. ڕێگه؛ ڕێچار؛ شوێنه‌ڕای کار و بیر ‹از کانـال قـانونی پیگیـری کـن!: لـه ڕێگـه‌ی قانوونیـه‌وه شوێنی بگره!›.

**کانال‌کشی** / kānālkešî ، ـها/: [فرانسوی/ فارسـی] /*اسم*. کانال‌کێشـی؛ کانـاڵ‌که‌شـی؛ کـار و ڕه‌وتی دروست‌کردن و دانانی کاناڵ.

**کانتینر** / kāntîner ، ـها/: [انگلیسی]/*اسم*. کانتینیر: ١. ماڵۆکه‌ی گه‌وره بۆ تێخستن و ڕاگوێزتنه‌وه‌ی بار (به کامیون، که‌شتی یان قه‌تار) ٢. تره‌یلیێ که وه‌ها ماڵۆکه‌یه‌کی له سه‌ره ٣. ئه‌و هه‌نده له بـار که له وه‌ها ماڵۆکه‌یه‌کدایه ‹یک کانتینر شکر خرید: کانتینرێک شه‌کری سه‌ند›.

**کاندوم** / kādom/: [انگلیسی] ☜ **کاپوت ـ٣**

**کاندید** / kāndîd/: [از فرانسوی] ☜ **کاندیدا**

**کاندیدا** / kāndîdā ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم*. ناڤـدێر؛ نـاودێر؛ بـه‌ربژار؛ پاڵـێوراو؛ ناڤـدایی؛ نـامزه‌د؛ ناڤلێکری؛ ناڤکری؛ ده‌ست‌نیشان؛ که‌سێ که بـۆ ئه‌نجامدانی کارێک ده‌ستی له سه‌ر نراوه یان بۆ خۆی هاتۆته پێشه‌وه ‹کاندیدای نمایندگی: ناڤدێری نوێنه‌رایه‌تی›: **کاندید**

**کانســار** / kānsār ، ـهـا/: [کـردی] *اسـم*. کانگـا؛ شوێنێ که یه‌ک یـان چه‌نـد کـانی بـه که‌ڵـکی تێدایه.

**کان‌سنگ** / kānsang/ [کردی/ فارسی] ☜ **کانه**

**کانفـت** / kāmfet, kānfet ، ـهـا/: [روسـی]/*اسـم*. کانفێت؛ چه‌شنێ شیرینی تۆپه‌ڵـی بچـووک بـه ڕه‌نگ و چێژه‌ی جۆراوجۆره‌وه کـه لـه کاکـائوو، شه‌کر و ئاونه‌وات دروست ده‌بێ.

**کان‌کن** / kānkan ، ـهـا/: [کـردی/ فارسـی] /*اسم*. ١. کرێکـاری کانگـا ٢. قومه‌شـکه‌ن؛ چاکـه‌ن؛

بیرکەن؛ چالاوکەن.

**کانگارو** / kāngāro/: [فرانسوی/ انگلیسی/ از یکی از زبانهای غیربومی شمال شرقی استرالیا] ☜ **کانگورو**

**کانگورو** / kāngoro ، ـها/: [فرانسوی/ انگلیسی/ از یکی از زبانهای غیربومی شمال شرقی استرالیا]/اسم. کانگورۆ؛ گیانەوەری گوانداری ئالفخۆر، کیسەدار، زاگەبەری ئوستراليا، بە پا و کلکی درێژ و دەستی کورتەوە کە گەورە و پچووکیان هەیە و بڕێکیان درەختژین: **کانگارو**

**کان‌لم یکن** / ka'anlamyakon/: [عربی] صفت. بەتاڵ؛ بێبڕ؛ بێبڕشت؛ بێهورم؛ بەبێ نرخ و بایەخ؛ هەر وەک نەبووبێ ‹بخشنامەی مذکور از این تاریخ کان‌لَم‌یکُن خواهد بود: بەخشنامەی ناوبراو لەمە بەدواوە بێبر دەبێ›.

**کانون** / kānûn ، ـها/: [سریانی از اکدی]/اسم. ۱. کانوون؛ ناوەند؛ ناوەندی چالاکی، کار یان سەرنج ‹کانون مبارزه؛ کانون زمین‌لرزه: ناوەندی شۆڕش؛ کانوونی بوومەلەرزە› ۲. کانوون؛ خاڵێ کە شەپۆل (تیشک، گەرما، دەنگ) لەوێدا بلاو یان کۆ دەبێتەوە ‹کانوون عدسی: کانوونی نیسکۆکە› ۳. مەکۆ؛ کۆگە؛ بنکە؛ ئەنجومەن؛ گرۆیەک کە بە بۆنەی هۆگرەتی یان قازانجی پیشەیی، لە جێگایەکدا کۆ دەبنەوە ‹کانون نویسندگان: مەکوی نووسەران› ٤. بنکە؛ مەکۆ؛ کۆگە؛ ئەنجومەن؛ جێگای کۆ بوونەوەی وەها گرۆیەک ‹امروز در کانون جشن بود: ئەورۆ لە بنکەدا جێژن بوو› ۵. [هندسه] کانوونی بەیزی ٦. کانوون؛ نێوی دوو مانگ لە ڕۆژژمێری هەتاوی ولاتانی عەرەبیدا.

▣ **کانون اصلاح و تربیت**: ناوەندی ڕاهێنان و بارهێنان؛ شوێنی ڕاگرتنی مندالان و تازەلاوانی تاوانبار.

**کانون اول**: کانوونی یەکەم؛ دوازدەهەمین مانگی سالی عەرەبی، ۳۱ ڕۆژە، بەرانبەر بە دیسامبر.

**کانون ثانی**: کانوونی دووهەم؛ چلەشۆڕ؛ مانگی یەکەمی سالی عەرەبی، ۳۱ ڕۆژە، بەرانبەر بە ژانویە.

**کانون خانواده**: ۱. کۆڕی بنەماڵە؛ مەکۆی خاوخێزان ۲. [کنایی] بنەماڵە؛ خاوخێزان؛ هەموو کەسانی مالێک و چۆنیەتی پێوەندییان پێکەوە.

**کانونی** / kānûnî/: [سریانی] صفت. کانوونی؛ ناوەندی؛ مەکۆیی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە ناوەندەوە ‹فاصلەی کانونی: مەودای ناوەندی› ۲. بە دۆخ یان چۆنیەتی کانوونەوە ‹کانونی شدن: مەکویی بوونەوە›.

**کانه** / kāne ، ـها/: [کردی] اسم. [ادبی] کانی؛ کانە؛ بەردی کانی؛ ماکی کانگایی و زۆرتر کانزایی کە لە باری ئابوورییەوە گرینگە و لە کانگاوە دەریدێنن: **کان‌سنگ**

**کانه** / ka'annahû/: [عربی] حرف. هەر وەک؛ وەکوو؛ وەکی؛ وەک؛ پێسەو؛ عەین؛ عەین و مەین ‹خیابان چنان خلوت بود، کانه بیابان برهوت: شەقام ئەوندە چۆڵ بوو، هەر وەک دەشتی کاکی بە کاکی›.

**کانی** / kānî ، ـها/: [کردی] اسم. کانی؛ کانگایی؛ مەعدەنی: ۱. سەر بە کانگا ‹مادەی کانی: ماکی کانگایی› ۲. دەرهاتوو لە مەعدەن ۳. ماکی سروشتی و زۆرتر بلۆری کە لە باری فیزیکی و کیمیاویەوە ناسراوە.

**کانی‌شناسی** / kānîšenāsî/: [کردی/ فارسی] اسم. کانی‌ناسی؛ لقێک لە زانستی زەوی‌ناسی کە لە سەر تایبەتمەندی و چۆنیەتی دروست بوون و جۆراجۆری کانی و جێگایان دەکۆلێتەوە.

**کانیون** / kān(i)yon ، ـها/: اسم. [جغرافیا] تەنگژە؛ تەنگەدەرە؛ دڕناڵ؛ کەنداڵ؛ ئاودڕ؛ دڕگە؛ شیوێکی باریک و قووڵ کە ئاوی لێ‌دەڕوا.

**کاو**[1] / kāv/: صفت. کاس؛ قووڵ؛ کووڕ؛ باهو؛ سووتار؛ سووتاڵ.

**ـکاو**[2]: پیوازه. ـکۆڵ؛ ـکول؛ ـ پشکێن؛ ـ پشکن؛

ــ وشکن؛ ـگیڵ؛ ـ دۆز؛ ـ تۆژ؛ ـ دەرەوە؛ ـکۆڵەرەوە؛ ـگەڕ ‹زمین‌کاو: زەوی‌کوڵ›.

**کاواک** / kāvāk/: *صفت. [ادبی]* بۆش؛ بەتاڵ؛ والا؛ هەڵۆڵ؛ هووڵ؛ هلۆڵ؛ قوڕۆڵ؛ قلۆر؛ قولۆر؛ نێوان‌خالی؛ ناوخالی.

**کاور** / kāver ، ـها/: [انگلیسی]*اسم.* پۆشەن؛ پۆشەر؛ ئەوی بۆ پاراستن یان داپۆشین بە سەر شتێکیدا دەکێشن، بەتایبەت رووپۆشی پەلاستیکی جل‌وبەرگ ‹کاور لباس: پوشەنی جل‌وبەرگ›.

**کاوش** / kāvoš ، ـها/: *اسم.* کنە؛ کەندوکۆڵ؛ کار ورەوتی کۆڵینەوە؛ کۆلان؛ کۆڵانەوە؛ کنەوە؛ ڤەکۆلان؛ تۆژینەوە؛ دانەوە؛ ئەوەدەی.

**کاوشگر** / kāvošgar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ڤەکۆڵ؛ تۆژەرەوە؛ کۆڵەرەوە؛ ئەوەی کە کاری کۆڵینەوەیە.

**کاوی**[1] / kāvî/: *اسم.* قوولی؛ کاسی؛ کووری؛ دۆخ یان چۆنیەتی چاڵ بوون.

**ـ کاوی**[2]: *پیوازه.* ـکۆلی؛ ـ پشکنی؛ ـ تۆژی؛ کار ورەوتی پشکنین، کۆڵین ‹روانکاوی: رەوان‌کولی›.

**کاویدن** / kāvîdan/: *مصدر متعدی.* // **کاوید:** کۆڵیتەوە؛ **می‌کاوی:** دەکۆڵیەوە؛ **بکاو:** بکۆڵەوە// ۱. کۆڵینەوە؛ کۆڵانەوە؛ کۆڵین؛ ڤەکۆڵین؛ دانەوە؛ کنەکردن؛ هەڵکۆڵین؛ هەڵکولۆشین؛ کەنتەی؛ بۆ پەیدا کردنی شتێک جێگایەک دانەوە ‹کاویدن غار: کولینی ئەشکەوت› ۲. پشکنین؛ گەڕان؛ گەڕیان؛ هلکەواشتن؛ هلکەوشاندن؛ لێگەڕیان؛ سەچتین؛ گێلەی؛ وشکنەی؛ لە تۆ‌ـتۆی شتێک گەڕان ‹کاویدن کتابها: پشکنینی کتێبان› ۳. کۆڵینەوە؛ تۆژینەوە؛ توێژینەوە؛ وەردانەوە؛ کنەکردن؛ وشکنەی؛ وشکنای؛ گەڕان و پشکنینی شتێک بۆ زانینی پێکهاتە و پێوەندی وردەکاریەکانی ‹کاویدن آثار بدست آمده: کولینەوەی شوێنەواری دەست کەوتوو›. هەروەها: **کاویدنی**

■ صفت فاعلی: **کاونده** (کۆڵەرەوە)/ صفت مفعولی: **کاویده** (کۆڵراوەوە)/ مصدر منفی: **نکاویدن** (نەکۆڵینەوە)

**کاه**[1] / kāh ، ـها/: *اسم.* کا؛ کاهـ ؛ کەهـ ؛ کی؛ کەی؛ سمەر؛ سمەری؛ هەلیز؛ پار؛ پیتە؛ بەڵم؛ وردەی کلۆش؛ ساقەتەی وردکراوی دەخڵ.

▣ **کاه هم بار کسی نکردن:** *[گفتاری، تعریض]* کەسێک بە کەریش حەساو نەکردن.

**از کاهی کوهی ساختن:** *[کنایی]* کێچ کردنە گا؛ زل‌کردنەوە؛ گەورە کردنەوەی لە ڕادە بەدەری شتێک.

**ـ کاه**[2]: *پیوازه.* ـکێش؛ ـ کوژ؛ کەم‌کەرەوە ‹جانکاه: گیانکێش›.

**کاهدان** / kāhdān ، ـها/: *اسم.* کادین؛ کادێن؛ کایەن؛ کەیان؛ کەیبان؛ کادان؛ کادانە: ۱. کەدوو؛ کەیو؛ کیو؛ تفاقدان؛ مەرەک؛ ئاخلە؛ کەدن؛ جێگەی کۆ کردنەوە و ڕاگرتنی خۆراکی چوارپێیان ۲. *[تعریض]* گەدە؛ ورگ؛ زگ؛ سک.

**کاهش** / kāheš/: *اسم.* ۱. ڕەوتی کەم بوونەوە ۲. کاری کەم‌کردنەوە ۳. مینها؛ ڕەوتی داشکان.

▣ **کاهش دادن:** کەم کردنەوە؛ کەم‌کردن؛ کێم‌کرن؛ هندکاندن؛ هەلساندن؛ پچکاندن؛ کەم‌کەردەیوە ‹این قرص دردم را کمی کاهش داد: ئەم حوبە ئێشەکەمی تۆزی کەم کردەوە›.

**کاهش یافتن:** کەم بوونەوە؛ کەم بوون؛ کێم بوون؛ کەمەوە بیەی؛ داشکان ‹از دیروز گرمای هوا کاهش یافت: لە دوێنێوە تینی گەرما کەم بوتەوە›.

**کاهشیاب** / kāhešyāb/: *اسم. [ریاضی]* چەندیەتیەک کە یەکێکی‌تری لێ کەم دەکەنەوە: **مَفروقٌ‌مِنْه**

**کاهگل** / kāhgel ، ـها/: *اسم.* کاگڵ؛ کاپۆڵ؛ کەگڵ؛ کەیگل؛ ئەبیە؛ تێکەڵی قوڕ و کا بۆ داپۆشینی سەربان و سواخدانی دیوار.

**کاهگلی** / kāhgelî/: *صفت.* کاگڵی؛ کاپۆلی؛

کەگلی؛ کەیگلی؛ کاگلدار یا لە جنسی کاگڵ ‹دیوار کاهگلی: دیواری کاگلی›.

**کاهل** / kāhel ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت. [ادبی]* زەمتە؛ تەوەزەل؛ تەمەڵ؛ کالووم؛ کەهاڵ: ١. تەپ؛ تەپلەوس؛ تەپلمۆس؛ دێراخێز؛ دێرخێز؛ مەرش؛ مەرشۆ؛ لەش‌قورس؛ بەبێ خێرایی پێویست لە کاردا ٢. مەدلمە؛ بێ‌هۆگرەتی بە کار و تێکۆشان.

**کاهلی** / kāhelî/: [عربی]/*سم. [ادبی]* تەمەڵی؛ زەمتەیی؛ تەوەزەلی؛ کەهاڵی: ١. تەپلەوسی؛ تەپلمۆسی؛ دێراخێزی؛ تەمەڵی؛ بێ‌خێرایی و ئازایی پێویست لە کاردا ٢. مەدلمەیی؛ دوورەپەرێزی لە کار و تێکۆشان.

**کاهن** / kāhen ، ـان؛ کَهَنە/: [عربی]/*سم.* کاهێن: ١. لە پلەگەلی دینی جوولەکە: **کَهن** ٢. مەلای فەلە و جوو و چەند دینی‌تر ٣. مەلای میللەتانی پێشوو (وەک بابیل و میسر).

**کاهو** / kāhû ، ـها/: *سم.* کاهوو؛ مارول؛ خاس؛ کێور؛ کیوەر؛ کییور؛ گیایەکی یەکساڵانی گەڵاپان و ئاودارە بە گوڵی زەرد و ساقەتەی ناسکەوە کە هەمووی بە کاڵی دەخورێ.

▣ **کاهوی افعی** ☜ **مَندَلَک**

**کاهوئی** / kāhû'î/ ☜ **کاهویی**

**کاهویی** / kāhûyî/ ☜ سبز کاهویی، **سبز: کاهوئی**

**کاهی** / kāhî/: *صفت.* کایی؛ کاهی: ١. کایینە؛ کاوێنە؛ دروستکراو لە کا ‹کاغذ کاهی: کاغەزی کایی› ٢. بە ڕەنگی کا.

**کاهیدگی** / kāhîdegî/: *سم.* دۆخ یان چۆنیەتی کەم بوونەوە.

**کاهیدن** / kāhîdan/: *مصدر. لازم. متعدی.* // **کاهیدی:** لاواز بووی؛ **می‌کاهی:** لاواز دەبی؛ **بکاه:** لاواز بە// ☐*لازم.* ١. لاواز بوون؛ لەڕ بوون؛ هەژار بیەی؛ هەجنین ٢. کەم بوونەوە؛ کێم بوونەوە. ☐ *متعدی.* ٣. کەم‌کردن؛ کەم‌کردنەوە؛ کێم‌کرن؛ هەندکاندن؛ هەلساندن؛ پچکاندن؛ کەم‌کەردەیوە؛ کەمەوەکەردەی؛ هەجناندن. هەروەها: **کاهیدنی**
■ **صفت فاعلی: کاهنده** (لاوازکەر)/ **صفت مفعولی: کاهیده** (لاوازبوو)/ **مصدر منفی: نکاهیدن** (لاواز نەبوون)

**کای** / kāy/:[؟] /*سم.* کای: ١. هۆزی ڕەش‌پێستی باشووری ئافریقا، لە خزمان و پێوەندیدارانی هۆزی سام، نیشتەجێی ولاتی بووتسوانا ٢. ـها/ هەر یەکە لە کەسانی ئەو هۆزە ✻ **هوتِنتُوت**

**کایت** / kāyt ، ـها/: [انگلیسی]/*سم.* کایت؛ ئامێرێک بۆ هەڵفڕینی تاکەکەسی بەبێ موتور، بریتی لە دوو باڵی گەورە، کە کەسێ خۆی پێوە دەبەستێ و لە بەرزاییێکەوە بەری دەداتەوە و باڵ دەگرێتەوە.

**کایت‌سوار** / kāytsavār ، ـها؛ ـان/: [انگلیسی/ فارسی]/*سم.* کایت‌سوار؛ کەسێ کە بە کایت دەفڕێ. هەروەها: **کایت‌سواری**

**کاینات** / kāyenāt/: [عربی]/*سم.* گەردوون؛ کۆی ئەو شتانەی لە زەمین و ئاسماندان: **کائنات**

▣ **کاینات جوّ** ☜ آثار عِلوی، **آثار**

**کایوت** / kāyot ، ـها/: [؟]/*سم.* کایوت؛ گیانەوەری گوانداری دەشتەکی، زاگەبەری ئامریکای باکووری کە زۆر لە گورگ دەکا.

**کباب** / kabāb/: [عربی]/*سم.* کەباب؛ کەواو؛ کواو؛ خواردەمەنیەک، بەتایبەت گۆشت، کە لە سەر ئاور یان کانزای داخ برژاوە.

▣ **کباب بختیاری:** کەبابی بەختیاری؛ جۆری کەبابی پلێک گۆشتی مەڕ و پلێک مریشک لە سێخ کراو.

**کباب برگ:** بەرگ؛ کەبابی توا ـ توا؛ گۆشتی بە ساتوور نەرم‌کراوی لە شیش دراوی لە سەر ئاگر برژاو.

**کباب تابه** ☜ **کباب ماهی‌تابه**

**کباب ترکی:** کەبابی ترکی؛ چەند پارچە

گۆشتی ئەستوور بە پیوازەوە بە سیخێکی هەڵواسراودا کراو، ئاورێک هاوقەدی شیشەکە و لە پەنای دەگرێ، گۆشت و پیواز بەرە ـ بەرە دەبرژێن و دادەتاشرێن.

**کباب تنوری**: کەبابی تەندووری؛ کەواو تەنووری؛ کەبابی نێو دەفرێک کە لە تەنووردا دەبرژێت.

**کباب چنجه**: کەبابی پەل؛ کەواو پل؛ کەواوێ کە گۆشتەکەی لەت ـ لەت‌کراوە و لە شیش دراوە.

**کباب شامی** ☜ **شامی**

**کباب کوبیده**: کەبابی کووبیدە؛ کەواو قیمە؛ جۆری کەبابی شیش لە گۆشت و چەوری و پیوازی چەرخ‌کراو.

**کباب ماهی‌تابه**: کەواو ناوتاوە؛ گۆشت و پیوازی چەرخکراوی لە تاوەدا سوورەوە کراو: **کباب تابه**

▣ **کباب شدن**: بوونه کەباب؛ بوون بە کەواو: ۱. برژان؛ ئامادە بوون بۆ خواردن ‹چند تا سیب‌زمینی گذاشتیم توی تنور کباب شد: چەند سێفەزەمینیمان خستە نێو تەندوورەوە برژان› ۲. *[مجازی]* پرووزان؛ بوون بە بریان؛ سووتان؛ هەڵقرچان؛ پرووکان؛ لە بەر تین یان کەسەرێکی زۆردا بوون ‹از دیدن این منظره جگرم کباب شد: بە بینینی ئەم دیمەنە جەرگم پرووزا›. هەروەها: **کباب کردن**

**کباب‌پز** / kabābpaz ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ۱. کەبابچی؛ کەواوچی؛ کەواوی؛ کەسێ کە کاری کەباب برژاندنە ۲. کەواوپەز؛ چەشنێ کوانوو بۆ برژاندنی کەباب.

**کبابه** / kabābe ، ـها/: اسم. کەبابە؛ دارچکێکی وەک بی بە گەڵای پەل ـ پەلی بێ‌تووک و نووک‌تیژ و گوڵی هێشوویی لە پەنای گەڵاکاندا.

▣ **کبابه‌ی چینی** ☜ **کبابه**

**کبابی**[1] / kabābî ، ـها/: [عربی]/اسم. کەبابی؛ کەواوی: ۱. کەبابچی؛ کەواوچی؛ گۆشت‌برێژ؛ کەسێ کە کاری دروست‌کردنی کەبابە ‹کبابی پول خرد نداشت، به جایش گوجه‌ی اضافی داد: کەبابی پوولەوردەی نەبوو لەبری تەماتەی زیادی پێدایـن› ۲. کەبابخانە؛ کەباب‌فرۆشی ‹ظهر رفته بودیم کبابی: نیوەڕۆ چووین بۆ کەبابی›.

**کبابی**[2]: صفت. کەبابی؛ کەواوی: ۱. شیاو بۆ کەباب ‹گوشت کبابی: گۆشتی کەبابی› ۲. برژاو؛ پیشیاگ؛ پیشیاو؛ کەباب‌کراو؛ کەواوکریاگ ‹سیب‌زمینی کبابی: سێفەزەمینی کەبابی›.

**کباده** / kabbāde ، ـها/: اسم. کەبادە؛ ئامێرێکی ئاسنی وەکوو کەوان بە درێژایی ۱,۵ میتر کە لە زۆرخانە بە سەر سەریانەوە سووڕی دەدەن.

▣ **کبّاده کشیدن**: کەبادەکێشان؛ کەبادە لە سەر سەر سووڕ دان.

**کبار** / kebār/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* گەورەگەل؛ گەورەیەل؛ مەزنان؛ مازنان؛ گەورێ؛ مرۆڤێت مەزن.

**کبالت** / kobālt/: [فرانسوی]/اسم. کوبالت؛ توخمی کیمیاوی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ۲۷ و کێشی ئەتومی ۵۸,۹۳، کە کانزایەکی میغناتیسی بە ڕەنگی سپیە و زۆرتر بۆ دروست کردنی ئالیاژ کەڵکی لێوەردەگرن: **کوبالت**

**کبد** / kabed/: [عربی]/اسم. جەرگ؛ جگەر؛ کەزەب؛ یەهەر؛ یەهەر؛ پشاڕەش؛ گەورەترین ئەندامی ناوەکی لەش لە لای ڕاستی زگەوە.

**کبدی** / kabedî/: [عربی] صفت. جگەری؛ یەهەری؛ پێوەندیدار یان هاوگەر بە جەرگەوە ‹بیماریهای کبدی: نەخۆشیگەلی جگەری›.

**کبر** / kabar/ ☜ **کَوَر**

**کبر** / kebar/: [عربی]/اسم. ۱. *[ادبی]* گەورەیی؛ گەورایی؛ مەزنی؛ مازنی؛ مەزناهی ۲. *[فقه]* تەمەنی پازدە ساڵی بۆ کوڕ و نۆ ساڵی بۆ کچ، کە نیشانەی گەورە بوون و پێگەیشتنە.

▣ **کبر سن**: بەساڵاچوویی؛ دانساڵی؛ ساڵداری.

**کبر** / kebr/: [عربی]*اسم. [ادبی]* لووت‌بەرزی؛ فیز؛ دەمار؛ دەعیە؛ خۆ بە زل‌زانی.

**کبرا**[1] / kobrā ، ـها/: [فرانسوی]*اسم.* کوبرا؛ ماری کوبرا؛ چەشنێ ماری زاگەبەری ئافریقا و ئاسیا بە سەر و ملی بەرز و پانەوە کە زۆر ژەهراویە و ژەهرەکەی تا ۲ میتر هەڵداوێ و برێکیان بۆ چاوی ڕاوەکەیانی دەخەن و بۆ ماوەیەک کوێری دەکەن: **مار زنگی؛ مار عینکی؛ مار کبرا**

**کبرا**[2]: [عربی] *صفت.* گەورە؛ گاورە؛ مەزن؛ مازن؛ **کبری**

**کبره** / kabare ، ـها/: *اسم.* قەشاوی؛ قەتماخە؛ قرتماغە؛ قرتماخە؛ کەپرە؛ کەپرۆکە؛ کەوەرە؛ قاشگ؛ توێ؛ بزمەتە؛ بزماتە؛ توێژاڵی مردووی سەر پێست (بە هۆی گەماری یان کاری زۆرەوە).

▣ **کبره بستن:** قەتماخە هێنان؛ کەپرە بە سەردا هاتن ‹**کف دستم** کبره بسته بود: لەپی دەستم قەتماخەی هێنابوو›.

**کبری** / kobrā/: [عربی] ☜ **کبرا**

**کبریا** / kebriyā/: [عربی]*اسم. [ادبی]* گەورەیی؛ مەزنی؛ مازنی؛ مەزناهی؛ پایەبەرزی.

**کبریت** / kebrît ، ـها/: [معرب از اکدی]*اسم.* شەمچە؛ شقارتە؛ شقارتێ؛ شخارتە؛ شەفرین؛ کبریت؛ کفتک؛ کوفریت؛ کوفتیک؛ نفتک؛ نفتەک؛ گۆرد؛ گورت؛ گۆگرد؛ چیلکەیەک کە بە سەرێکیەوە گۆگرد هەیە بۆ داییساندنی ئاور ۲. بەستە یان قوتووی شەمچە.

▣ **کبریت زدن/ کشیدن:** شەمچەلێدان؛ شەمچە ڕۆشن‌کردن؛ شقارتە داگیرساندن؛ شقارتێ تەقنەی؛ گۆگرد هەڵکردن ‹کبریت زد و سیگاری روشن کرد: شەمچەی لێدا و جگەرەیەکی داگرساند›.

**کبریت زدن به چیزی:** ۱. شەمچە لە شتێک دان؛ شتێک داگیرساندن؛ شتێ هەڵگرساندن ‹کبریت زد بە فتیله: شەمچەی دا لە فتیلەکە› ۲. ئاور تێبەردان؛ گڕ دان؛ شقارتە بە شتێکەوە نان؛ لە بەین بردنی شتێک بە ئاور ‹کبریت زد به کاغذپاره‌ها؛ کبریت زد به مالش: گڕی بەردایە **ئەو کاغەزەشڕانەوە**؛ ئاوری بەردایە **ماڵی**›.

**کبریتی** / kebrîtî/: [معرب] *صفت.* خێڕ ـ خێڕ؛ خێڵ ـ خێڵ؛ بە نەخش و نیگاری ڕێ ـ ڕێوە ‹**مخمل** کبریتی: **مەخمەڵی** خیر ـ خیر›.

**کبک** / kabk ، ـها/: *اسم.* کەو؛ کاو؛ کەومک؛ کەڤ؛ زارا؛ زرەژ؛ ژەرەژ؛ ژەرەژی؛ زارانز؛ زارانج؛ باڵندەیەکی زەوی‌ژی، بە جەستەیەکی خڕی هێندێک لە کۆتر زلتر، پای سوور و دەندووکی خوار و ئەستوورەوە کە بۆ گۆشتەکەی ڕاوی دەکەن.

▣ **کبک دری:** کەودەری؛ باڵدارێکی جنجیرە بە قەد مریشکێ دەبێ لە نزیک بەفران دەژی.

**کبک ماده:** چێڵ؛ چیل؛ ماکەو؛ ماری؛ کەوی مێ؛ مێ کەو.

**کبک نر:** بەق؛ هەکە؛ نێرەکەو؛ کەوی نێر.

▣ **کبک کسی خروس خواندن:** *[مجازی]* بە جووچکە گوێز شکاندن؛ بە تڕ گۆزەڵە شکاندن؛ بەرزەی دەماخ هاتن؛ پای کەسێ زەوی نەگرتن؛ پێقەو سمێلاو یۆی ئامەی ‹**این روزها** کبک سارا خروس می‌خواند: ئەم ڕۆژانە سارا بە جووچکە گوێز ئەشکێنێ›.

**کبکبه** / kabkabe/: [عربی]*اسم.* ۱. سەنسەنە؛ تەنتەنە؛ جەلال و شکۆ ۲. هەنگ و ونگ؛ هەرا و زڵەیەک کە بە بۆنەی تێپەڕینی کەسێکی پایەبەرزەوە هەڵدەستێ (وەک دەنگی بۆقی ماشین و هەرای دەور و پشتیەکانی).

**کبوتر** / kabûtar/: *اسم.* کۆتر؛ کەفتەر؛ کەمووتەر؛ کاوەتری: ۱. *[نجوم]* وێنەی ئاسمانی بچووک لە ئاسمانی لەتەگۆی باشووریدا: **حَمامه** ۲. ـها؛ ـان/ کەڤۆک؛ کابۆک؛ کواتر؛ کوتر؛ کاڤۆک؛ کاپۆک؛ گۆگەرجین؛ کەمۆتەر؛ کەمووتەر؛ کەمووتر؛ کەبووتەر؛ گۆتر؛ بەهێڤ؛ باڵندەیەک بە جەستەی پڕ، باڵی نووک‌تیژ و

کلکی درێژەوە کە نێر و مێیان وەک یەکن و لە سەر دار یان لە کونی دیواران هێلانە دەکەن: **کفتر**

▣ **کبوتر چاهی**: گابەل؛ گاپەڵ؛ گاپڵ؛ کۆترەشینە؛ کۆترە کێویلە؛ کۆترە کێفیلە؛ کۆترە گایلکە؛ کۆترەگایە؛ کەمووتر برجی؛ جۆرێ کۆتری قەڵەوە لە کۆتری ئاسایی زلتر کە لە چیا دەژی.

**کبوترباز** / kabûtarbāz ، ـها؛ ـان/: صفت. کۆترباز؛ کەبۆتەرڤان؛ بە هۆگرەتی و خواستی بەخێو کردنی کۆتر. هەروەها: **کبوتربازی**

**کبوترخان** / kabûtarxān ، ـها/:اسم. کۆترخان؛ کۆترخانە؛ بۆرانخانە؛ لیس؛ هۆدە یان ژوورێک کە بۆ کۆتران سازی دەکەن.

**کبود**[1] / kabûd/:اسم. کەوە؛ کەوێ؛ کەوو؛ کەوگ؛ کەوک؛ کۆ؛ کەو؛ بۆز؛ بۆزە؛ هێشین؛ هەشین؛ هەشی؛ شین؛ هەشینایی؛ ڕەنگی ئاوی تۆخ.

**کبود**[2]: صفت. بۆز؛ بۆزە؛ کەوە؛ کەوێ؛ کەوو؛ کەوگ؛ کۆ؛ کەو؛ هەشینایی؛ بە ڕەنگی ئاوی تۆخ. هەروەها: **کبودرنگ؛ کبودفام**

**کبودماهی** / kabûdmāhî ، ـها؛ ـان/:اسم. ماسیەکی خرپنەی ئاوی گەرمە بە ڕەنگی کەوە کە سەر پشتی سەوز و ژێر سکی زێوینە.

**کبودمرغ** / kabûdmorq/:اسم. پرندەی آبی ☜ **پرنده**

**کبوده** / kabûde ، ـها/:اسم. ١. سپیدار؛ ئەسپندار؛ سپیندار؛ هەوران؛ سپیەچنار؛ هەڤران؛ شاتان؛ ئەسپین؛ دارێکە بە تاجێکی باز و هێلکەیی، گەڵای سپی لۆکەئاسا، چرۆی سپی و تاڵ‌تاڵ و جەوی چەسپنەوە ٢. *[قدیمی]* کوێت؛ ئەسپی خۆڵەمێشی.

**کبودی** / kabûdî/:اسم. کەوەیی؛ کەوویی؛ کەوگی؛ کهۆیی؛ هەشینایی؛ شینی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی شین بوون ‹هرگز دریا را به این کبودی ندیده‌بودم: قەت زەریام بەم کەوەییە نەدیبوو› ٢. *ـها/* تەرجسە؛ ڕجرج؛ پەڵەی شینی هۆی کوتران یان سەرما لە جەستەدا ‹کبودی صورتت از چیست؟:کەوەیی ڕومەتت لە چیە؟›.

**کبیر** / kabîr/: [عربی] *صفت.* ١. مازن؛ مەزن؛ یەکجار گەورە ‹اقیانوس کبیر: ئوقیانووسی مازن› ٢. مەزن؛ مازن؛ هەڤیاز؛ زۆر لە سەرەوەوە ‹امیر کبیر: میر مەزن› ٣. *[حقوق]* گەورە؛ کەبیر؛ خاوەن تەمەنی قانوونی. بەرانبەر: **صغیر** ‹هر فرد کبیر می‌تواند در انتخابات شرکت کند: هەر کەسێکی گەورە دەتوانێ لە دەنگداندا بەشدار بێ›.

**کبیره** / kabîre/: [عربی] ☜ گناه کبیره، **گناه**

**کبیسه** / kabîse/: [معرب از سریانی]/اسم. کەبیسە؛ ساڵێ کە ٣٦٦ ڕۆژە.

**کپاره** / kapāre ، ـها/:اسم. *[قدیمی]* کەتلە؛ دەسەچینە؛ پووشینە؛ زەمبیل؛ زەمیل؛ زەمیلە؛ زەنبیل؛ دەفری هێندێ گەورەی لە شوول چنراو.

**کپال** / kopāl/: [؟]/اسم. کۆپال؛ جەوی بڕێ داری گەرمیانی کە بۆ دروست‌کردنی لاک و وێرنی بە کار دێ.

**کپر** / kapar ، ـها/: [کردی]/اسم. کەپەر؛ کەپر؛ کەپرە؛ هەرزەل؛ هەرزەلە؛ هەرزاڵ؛ ساباط (کوێستانی)؛ هۆلک؛ کوولا؛ کۆلک؛ ماڵۆکەی لە شوول و قامیش.

**کپرا** / koprā ، ـها/: [؟]/اسم. نارگیل؛ بەشی سپی و خۆراکی میوەی نارگیل کە وشکی دەکەن و بۆ ڕۆنی نارگیل و لە شیرینی‌سازیشدا بە کاری دەبەن: **کوپرا**

**کپرنشین** / kaparnešîn ، ـها؛ ـان/: [کردی/ فارسی] /اسم. کەپرنشین؛ هەرزەل‌نشین؛ کوولانشین: ١. ئەوەی لە نێو کەپردا ژیان دەباتە سەر ٢. *[کنایی]* هەژاری بێ ماڵ و سامان.

**کپسول** / kapsûl ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کەپسوول: ١. دەفری گرۆڤەر و زۆرتر کانزایی

‹کپسول گاز: کەپسوولی گاز› ۲. پوودری دەرمان بە پۆشەنی ژیلاتینی گرۆڤەریەوە.

▣ **کپسول آتش‌نشانی:** کەپسوولی ئاورتەمرێنی؛ دەفری گرۆڤەری دەرگابەسراو پڕ لە ماکی ئاورتەمرێن کە لە کاتی سووتماندا بۆ کوژاندنەوەی ئاور کەڵکی لێ‌دەگرن.

**کپسول گاز:** کەپسوولی گاز؛ دەفری گرۆڤەری جێی گاز بەتایبەت گازی میتان، زۆرتر بۆ ماڵان.

**کپک**[1] / kapak، ـهـا/: اسم. کەڕوو؛ کەڕو؛ کەڕەکیفە؛ کەڕەوە؛ کەڕێ؛ کەوە؛ بەرش؛ پەرک؛ پرگ؛ پولگ؛ جۆرێک کارگ و لاکوتی یەکجار ورد کە دەبنە هۆی کەڕوو هێنانی خواردەمەنی و برێکیشیان بۆ دەرمان دەبن: **کَفَک**

▣ **کپک آبزی:** کەڕووی ئاوژی؛ برشی ئاوی شیرین و خاکی شێدار.

**کپک سبز:** کەڕووی/ برشی شین؛ کەڕەکیفەی ناسراو بە پینی‌سیلیۆم کە لە سەر چەرم و میوە دەنیشێ و خراپیان دەکا. لە برێکیان ماکی ئانتی‌بیووتیک دروست دەکەن.

**کپک سفید:** کەڕووی سپی؛ کەڕوویەک کە لە سەر نانی نەرم دەنیشێ و گەشە دەکا: **کپک نان**

**کپک سیاه:** کەڕووی ڕەش؛ کەڕوویەک کە لە سەر پەنیر و میوەی گەیشتوو دەنیشێ.

**کپک نان** ☜ **کَپک سفید**

▣ **کپک زدن:** برش هێنان؛ کەڕوو هەڵێنان؛ کەڕەکیفە هاوردن؛ کەڕوواوی/ کەڕواوی بوون؛ دەزی بوون؛ پرگ هەڵێنان؛ کەڕۆڵیەی؛ کەڕۆڵیای؛ گەشە ساندنی کەڕوو لە سەر خۆراک ‹پنیر کپک زده بود، دور انداختم: پەنیرەکە برشی هێنابوو، فڕەم دا›.

**کپک**[2]: صفت. [تعریض، گفتاری] کۆتی؛ کەتوەر؛ خۆری‌تۆڕی؛ خوێریلە؛ خوێری؛ مشەخۆر؛ لاورگە؛ هەوانتەخۆر؛ مڕ و مووشکەر؛ خۆژێ؛ چەڵ و مەل؛ چەورە؛ خۆرە؛ پەڵندەر؛ مفت‌خۆر؛ مەلۆس؛ ژیان لە سەر ئەرکی کەسانی‌تر.

**کپک** / kopek، ـهـا/: [روسی]/اسم. کۆپێک؛ وردەپارەی ڕووبڵ، یەکەی پوولی ڕووسیە و دراوسێکانی.

**کپک‌زدگی** / kapakzadegî/: اسم. برش‌هێناوی؛ کەڕووهێناوی؛ کەڕۆلیایی؛ کەڕەکیفەلێداگی؛ گرنۆزی؛ برشاوی؛ دۆخ یان ڕەوتی کەڕوو هێنان. هەروەها: **کپک‌زده**

**کپل** / kapal/: [از عربی] ☜ **کفل**

**کپل** / kopol، ـها/: صفت. [گفتاری] خەپلە؛ خەپە؛ خرپن؛ خیپن؛ خەپەل؛ خەپەلە؛ خەپەلێ؛ خرت؛ خرتەلە؛ خرتەلێ؛ گردەڵ؛ گردەلە؛ قرپنە؛ کورتەبالای قەڵەوی ڕەزاسووک.

**کپلک** / kapalak، ـها/: اسم. کەپەلەک؛ گیابڕ؛ کرمی لاکوتی گیانەوەرانی‌تر، بەتایبەت ئاژەڵ.

**کپنک** / kapanak، ـها/: [کردی]/اسم. کەپەن؛ کەپەنە؛ کەپەنک؛ کەپەنەک؛ کەچە؛ قاپووت؛ گەرگ؛ تاتکێ؛ کەڕەک؛ فەرەنجی؛ فەرەجی؛ بالاپۆشی لە لباد، زۆرتر بێ‌قۆڵ و بەرتاک کە شوانان و کەژوانان لە بەری دەکەن.

**کپور** / kapûr، ـها/: اسم. کەپوور؛ چەشنێ ماسی خۆراکی: **ماهی کپور**

**کپه** / kape/: اسم. ۱. [قدیمی] ناوە؛ کەتلە؛ زەنبیلەی گەورەی لە شوول یان زەل ۲. [گفتاری] کپەنە؛ خپ؛ پەنەمووسە؛ وشەیەکی بە تانە و تەشەرەوە بۆ خەو.

▣ **کپه کردن:** وەرکەتن؛ کپین؛ پەنەمووس کەردەی؛ خپ/ کپ هەلاتن؛ خپ‌کەوتەی.

**کپه‌ی مرگ را گذاشتن:** [تعریض] خەو مەرگ کردن؛ سەر نانەوە؛ سەر نیانەوە؛ پەنەمووس کەردەی؛ خەوتن ‹می‌گذارید کمی کپه‌ی مرگم را بگذارم؟: دێڵن تاوێ خەوی مەرگم بکەم؟›.

**کپه** / koppe، ـها/: اسم. [گفتاری] کۆما؛ کۆمە؛ کوا؛ کوم؛ کۆ؛ تۆپەڵ؛ تەپ؛ تەپکە؛ کەلەک؛

کۆمەڵێک شتی بەسەر یەکدا کۆوە بوو ‹کُپەی خاک: کۆمای خاک›.

◘ **کپه شدن:** تەپکە بەستن/ کردن؛ کەڵەک/ کەڵەکە بوون/ بەستن؛ کەلار بوون؛ قەڵاپەچن بوون؛ قەڵاچین بیەی؛ کۆ بوونەوە و بە سەر یەکدا کەوتن ‹کتابها روی هم کپه شده بودند: کتێبەکان بە سەریەکدا تەپکەیان بەستبوو›.

هەروەها: **کپه کردن**

**کپی** / kepî ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کێپی؛ چەشنێ کڵاو کە لە پێشەوە سەیوانێکی چکۆلەی هەیە.

**کپی** / kopî ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کوپی؛ ڕۆنفیس؛ ڕایش: **کپیه**

◘ **کپی برداشتن:** ڕایش گرتن؛ کوپی/ ڕۆنفیس هەڵگرتن ‹انگار از روی این کتاب کپی برداشته: وەک دەڵێی لە ڕووی ئەم کتێبە ڕایشی گرتووە›.

**کپی کردن:** کوپی کردن؛ ڕایش کردن: ١. لە بەر نووسینەوە؛ فەرکان؛ ڕوونووسی کردن ‹از روی ورقەی بغل‌دستی کپی کرد: لە ڕووی پاڵدەسیەکەی کوپی کرد› ٢. لە ڕووی وێنەیەک کێشانەوە ٣. لە وێنەیەک دیسانەکە چاپ کردن ‹دو نسخه از این عکس کپی کن!: دوو بەرگ لەم وێنەیە کوپی کە!›.

**کپی گرفتن:** ڕایش گرتن؛ کوپی گرتن؛ بە ماشینی فتوکوپی لە بەڵگەیەک ڕۆنفیس گرتن ‹از این صفحه کپی بگیر بیاور!: لەم لاپەڕە ڕایش بگرە و بیهێنە!›.

**کپیدن** / kapîdan/: مصدر. لازم. [گفتاری] //**کپیدی:** دارایتەوە؛ **می کپی:** دەداریەوە؛ **بکپ:** بدارەوە// دارانەوە؛ داریانەوە؛ لار بوونەوە؛ لارەو بوون؛ کپین؛ وەرکەتن؛ خپ/ کپ بوون؛ خپ/ کپ هەڵاتن؛ پەنەمووس کەردەی؛ خپ کەوتەی؛ خەوتن؛ نووستن (ئەم وشە تەنیا بۆ سووکایەتی پێ کردن بە کار دەبرێ) ‹تا شامش را خورد کپید: هەر شێوەکەی خوارد دارایەوە›.

■ **صفت مفعولی: کپیده** (داراووە)/ **مصدر منفی:** **نکپیدن** (نەدارانەوە)

**کپی رایت** / kopîrāyt/: [فرانسوی/ انگلیسی]/اسم. کوپی‌ڕایت؛ مافی بەدیهێنەر بۆ کەڵک گرتن لە ئاسەوارەکەی (هونەری، وێژەیی یان پیشەیی).

**کپیه** / kopiye/: [فرانسوی] ☜ **کُپی**

◘ **کاغذ کپیه:** کاغذ کاربن ☜ **کاغذ**

**کت** / kat/: اسم. [گفتاری] شان؛ باهۆ؛ پیل؛ هەرمە.

◘ **کت کسی را از پشت بستن:** دەستی کەسێ لە پشتەوە بەستن: ١. کەسێک قۆڵبەس کردن ٢. [مجازی] لە کەسێ بردنەوە؛ لە کەسێ پێشکەوتن ‹آزاد در ریاضی کت همه را از پشت بسته بود: ئازاد لە بیرکاریدا دەستی هەمووی لە پشتەوە بەستبوو›.

**توی کت کسی کردن:** [مجازی] کەسێک فاماندن؛ بە مێشکی کەسێکدا کردن؛ کەسێک تێگەیاندن ‹چقدر زور زدم توی کت آرام بکنم که این دختر به دردش نمی‌خورد: چەندە تێکۆشام تا ئارام بفامێنم ئەو کچە بۆ ئەو نابێ›.

**توی کت کسی نرفتن:** [مجازی] بە سەری/ گوێی کەسێکدا نەچوون؛ ڕازی نەبوونی کەسێک ‹این حرفها توی کت من نمی‌رود: ئەم قسانەم بە سەردا ناچێ›.

**کت** / kot ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. سترە؛ کۆت؛ کوت؛ چەشنێ پۆشەن کە لە پێشەوە بە دووگمە دەبەسرێ و زۆرتر ئاستەڕ، قۆڵ و گیرفانی هەیە.

**کتاب** / ketāb ، ـها؛ کُتُب/: [عربی]/اسم. کتێب؛ کتێو؛ کتاف؛ کتاو؛ پەڕتووک: ١. کۆمەڵێک نووسراوە لە سەر پەڕەی کاغەز، پێست یان پاپیرووس و وەکوو ئەوانە ٢. نووسراوەیەکی چاپی جزوبەندی کراو و بەرگ گیراو بە لانی کەم ٤٨ پەڕەوە ٣. کتێبی دینی، بەتایبەت قورئان ٤. هەر یەکە لە بەشگەلی بەرهەمێکی زانستی یان وێژەیی ‹کتاب دوم از بخش اول تاریخ مشاهیر

کُرد: کتێبی دووهەم لە بەشی یەکەمی مێژووی ناودارانی کورد›.

**کتاب آسمانی:** کتێبی ئاسمانی؛ کتێبی دینی کە بە بڕوای شوێنکەوتوانی لە لایەن خواوە بۆ پەیامنێری ئەو دینە هاتۆتە خوار.

**کتاب آشپزی:** کتێبی شێوکەری؛ کتێبی ئاشپەزی؛ کتێبێ کە شێوەی لێنان و ئامادە کردنی چێشتی تێدا نووسراوە. هەروەها: **کتاب خیاطی؛ کتاب گلدوزی**

**کتاب خطی:** کتێبی دەس‌نووس؛ کتێبێ کە بە دەست نووسراوە.

**کتاب خودآموز** ☜ **خودآموز**

**کتاب درسی:** کتێبی وانەیی؛ کتێوی دەرسی؛ کتێبێ کە نووسراوەکانی لە یەک یان چەند ڕێخراوەی فێرکاریدا دەگوترێتەوە.

**کتاب دینی:** کتێبی دینی/ ئایینی؛ کتێبێ سەبارەت بە ڕاهێنانی دینێک.

**کتاب راهنما:** کتێبی ڕێنما؛ پەرتووکی ڕێنوێن؛ کتێبێ کە ئاگاداریگەلێکی بۆ ڕێنوێنی خوێنەر لە بوارێکی تایبەتدا تێدا نووسراوە ‹کتاب راهنمای تلفن: کتێبی ڕێنمای تەلەفوون›.

**کتاب ضالّه:** کتێبی شەیتان؛ کتێبێ کە نووسراوەکانی بە هۆی سەرلێ‌شێواوی خوێنەر دەزانن.

**کتاب کودک:** کتێبی منداڵان؛ کتێبوو زاوڵا/ زاوڵەی؛ کتێبی تایبەتی خویندنەوەی منداڵان.

**کتاب گویا:** کتێبێ کە نووسراوەکانی لە سەر شریت تۆمارکراوە.

**کُتّاب** / kottāb/: [عربی] جمعِ ☜ **کاتب**

**کتاب آرایی** / ketābārāyî/: [عربی/ فارسی]/اسم. کتێب‌ڕازێنی؛ کار، ڕەوت، فەن یان هونەری ڕازاندنەوەی کتێب بە وێنە، سەرناو، خشتە و پەڕەچنینی شیاو.

**کتاب‌باز** / ketāb.bāz، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* کتێب‌باز؛ کتێوباز؛ هۆگری خڕکردنەوە و هەڵگرتنی کتێب: **کتابدوست ـ٣.** هەروەها: **کتاب‌بازی**

**کتاب‌بر** / ketāb.bar، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کتێب‌بەر؛ ئامێرێ بە شێوەی قەفەسەی چەرخدار بۆ گواستنەوەی کتێب لە شوێنێکی وەک کتێبخانەدا.

**کتابت** / ketābat/: [عربی]/*اسم.*/*[ادبی]* کار و ڕەوتی نوسرانەوە یان نووسینەوە؛ نووسین ‹پس از آنکه قرارداد کتابت شد، همه آن را امضا کردند: دوای ئەوە کە بڕیارنامەکە نووسرایەوە، هەموو واژۆیان لێدا›. هەروەها: **کتابت شدن؛ کتابت کردن**

**کتابچه** / ketābče، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کتێبۆک: ١. *[گفتاری]* سیپارە؛ کتێبی چکۆلە ‹کتابچەی مشق: کتێبوکی مەشق› ٢. نامیلکە؛ کتێبێکی چکۆلە کە لە ٤٨ لاپەڕە کەمتر بێت ‹کتابچەی راهنما: کتێبوکی ڕێنما›.

**کتابخانه** / ketābxāne، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کتێبخانە؛ کتێوخانە: ١. جێگایەک کە تاقمێ کتێبی تێدا هەڵدەگرن ٢. بینایەک بە ئامێری پێویست (وەکوو کتێب، قەفەسە، پێڕست، ئەسکەمل و...) بۆ کۆکردنەوە و ئاگاداری‌کردن لە کتێبان و کەڵک وەرگرتنی کەسانێ کە هات‌وچۆی ئەوێ دەکەن ‹کتابخانەی دانشگاه: کتێبخانەی زانستگا› ٣. قەفەسەی کتێب ٤. *[قدیمی]* کتێب‌فرۆشی؛ پەرتووک‌فرۆشی.

**کتابخانەی تخصصی:** کتێبخانەی پسپۆڕی؛ کتێوخانەیەک کە کتێبانی بوارێکی تایبەتی تێدا هەڵدەگرن.

**کتابخانەی خصوصی:** کتێبخانەی تایبەت؛ کتێوخانەیەک کە هی کەس یان کەسانێکی تایبەتە: **کتابخانەی شخصی**

**کتابخانەی سیار:** کتێبخانەی گەڕۆک؛ ماشینێکی گەورە (زۆرتر پاس) کە لە ناوەوە

وەک کتێبخانە قەفەسەبەندی کراوە و زۆرێک کتێبی تێنراوە و بۆ دەرکی مالان یان هەر شوێنێکی پێویستی دەبەن.

**کتابخانەی شخصی** ☜ **کتابخانەی خصوصی**

**کتابخانەی عمومی**: کتێبخانەی گشتی؛ کتێوخانەیێ کە بۆ کەلک وەرگرتنی هەموان دانراوە: **کتابخانەی همگانی**

**کتابخانەی همگانی** ☜ **کتابخانەی عمومی**

**کتابخوان** / ketābxān ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* کتێبخوێن؛ کتاوخوین: ١. خوێنەری کتێب ٢. هۆگری خوێندنەوەی کتێب. هەروەها: **کتابخوانی**

**کتابدار** / ketābdār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کتێبدار؛ کتێودار؛ پەرتووکدار: ١. کەسێ کە کاری پۆلبەندی، تەرتیبکردن، ئاگاداری و پێرست دانانی کتێبگەلی کتێبخانەیە ٢. کەسێ کە بەڕێوە بردنی کتێبخانە و وەرامدانەوەی خەلکی وەئەستۆیە.

**کتابداری** / ketābdārî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کتێبداری؛ کتێوداری؛ پەرتووکداری؛ زانست و لێزانی ئاگاداری لە کتێب و بەڕێوە بردنی کتێبخانە.

**کتابدوست** / ketābdûst ، ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* کتێبدۆست؛ کتاودۆس؛ کتێبیار؛ کتێویار: ١. هۆگر بە کتێب خوێندنەوە ٢. خوازیاری بلاو بوونەوەی کتێب و گەشەکردنی کتێب خوێندنەوە ٣. ☜ **کتابباز**. هەروەها: **کتابدوستی**

**کتابسرا** / ketābsarā/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کتێبفرۆشی؛ کتێوفرۆشی؛ پەرتووکفرۆشی؛ دووکان و شوێنی فرۆشتنی کتێبان.

**کتابشناس** / ketābšenās ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* کتێبناس؛ کتێوناس؛ پەرتووکناس؛ خاوەن ئاگاداری لە بواری کتێب، نووسەر، جێگای بلاو بوونەوە و شوێنی دەسکەوتنیان.

**کتابشناسی** / ketābšenāsî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کتێبناسی؛ کتێوناسی؛ پەرتووکناسی: ١. زانستی ناسینی سەرجەمی کتێبانی سەبارەت بە نووسەر، بابەت یان ولاتێک و پێکهێنانی پێرستێک لەوانە ٢. ☜ **کتابنامه**

**کتابفروش** / ketābfurûš ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کتێبفرۆش؛ پەرتووکفرۆش؛ کتێبورەش؛ کتاوفرووش؛ کەسێ کە کاری کڕین و فرۆشتنی کتێبە.

**کتابفروشی** / ketābfurûšî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کتێبفرۆشی؛ کتێوفرۆشی؛ کتێبورەشی؛ کتاوفرووشی؛ پەرتووکفرۆشی: ١. پیشەی کتێبفرۆش ‹مدتی جلو دانشگاه کتابفروشی می‌کرد: ماوەیەک لە بەرامبەر زانستگادا کتێبفرۆشی دەکرد› ٢. ـها/ فرۆشگای کتێب ‹چند هفته است به کتابفروشی سر نزده‌ام: چەند حەوتەیە سەرم لە کتێبفرۆشی نەداوە›.

**کتابگیر** / ketābgîr/: [عربی/ فارسی] ☜ **غشگیر**

**کتابنامه** / ketābnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کتێبنامە؛ پەرتووکنامە: ١. پێرستێ لە کتێبگەلی نووسەر، کتێبخانە یان بابەتێک، وێڕای ئاگاداریگەلێک لەمەڕ کاتی نووسین و چۆنیەتی چاپ و بلاو بوونەوەیان ‹کتابنامه‌ی علوم: کتێبنامەی زانست› ٢. پێرستێ لە سەرچاوەگەلێ کە لە نووسینی کتێب یان وتارێکدا کەلکێ لێ وەرگیراوە ‹کتابنامه را ببینید: کتێبنامەکە چاو لێ بکەن› * **کتابشناسی ـ٢**

**کتابی**[1] / ketābî/: [عربی] *صفت.* کتێبی؛ کتێوی: ١. بە شێوە یان چۆنیەتی نووسین ‹کتابی حرف زدن: کتێبی قسە کردن› ٢. بە شێوەی چوارپالوو ‹شیشه‌ی کتابی: شووشەی کتێبی›.

**کتابی**[2]: *قید.* پالبەپال؛ لە تەنیشت؛ شانبەشان؛ لە لای یەک بەبێ مەودا ‹کتابی بنشینید!: پالبەپال دانیشن!›.

**کتابیار** / ketābyār/: [عربی/ فارسی]/*اسم.*

کتێب ڕاگر؛ ئامرازێکی له چێو، پەلاستیک یان کانزا بۆ ڕاست لەبەر چاو ڕاگرتنی کتێب.

**کتام** / katām ، ـها/: اسم. *[قدیمی]* سخر؛ سخرک؛ زنج؛ دیوی له قامیش و حەسیر له قەراخی کشتوکاڵ و کیاردا.

**کتان** / katān/: [اکدی] *اسم.* کەتان: ۱. *لـ ـها/* هەلاوە؛ لۆکەکێوی؛ گیامێروول؛ گیامرۆژە؛ گیای ئالیکی یەکسالان و بێ‌پرز، بە گەڵای سەوزی باریک و درێژ و نووک‌تیژ، گوڵی ئاوی درشت و لقی ڕیشاڵ ـ ڕیشاڵی نەرم و بلندەوە ۲. پارچە یان بەنی دروست‌کراو له ڕیشاڵ و هەودای ئەو گیایە.

**کتانی**[1] / katānî/: [اکدی] ☜ گُل کتانی، **گل**

**کتانی**[2]: *صفت.* کەتانی: ۱. دروست‌کراو له کەتان یان له چەشنی کەتان ۲. پەمۆیی؛ لۆکەیی؛ دروست‌کراو له هەودای لۆکە.

**کتب** / kotob/: [عربی] جمعِ ☜ **کِتاب**

**کتباً** / katban/: [عربی] *قید.* بە نووسراوەیی؛ بە نووسین؛ بە شێوەی نووسراوە ‹کتباً تقاضا کرد: بە نووسین داخوازی کرد›.

**کت‌بسته** / katbaste/: *قید.* قۆڵبەست؛ باڵبەس؛ قۆڵ‌بەستە؛ قۆڵبەست‌کراو ‹او را کت‌بسته تحویل زندان دادند: قۆڵبەست ڕادەستی بەندیخانەیان کرد›.

**کتبی** / katbî/: [عربی] *صفت.* نووسراو؛ نووسراوە؛ نڤیسی؛ نڤیسکی ‹امتحان کتبی؛ تقاضای کتبی: ئەزموونی نووسراو؛ داخوازی نووسراوە›.

**کتره** / katre/: *صفت.* ۱. شڕ و شیتاڵ؛ شڕ و وڕ؛ شڕ و دڕ؛ لەت‌ـلەت؛ کەت‌کەتە؛ لەتار ـ لەتار؛ تیکە‌ـتیکە؛ کوت‌ـکوت؛ شەقاروەقار ۲. [ترکی؟] شێواو؛ بێ‌سەرەوبەرە؛ بێ‌سەروبەر؛ ئاڵۆز؛ منتەوەش؛ ژەلمسە؛ شیڤیا؛ شێویاگ؛ بێ‌ڕێک‌وپێکی (زۆرتر بۆ قسە).

**کتره‌ای** / katre'î/: [ترکی؟] *قید.* گۆترە؛ بە گۆترە؛ ڕەمەکی؛ برە؛ هەروا؛ (بە) هاکۆ؛ بە شێوەیەکی نەگونجاو و بێ‌تێفکرین ‹کترەای حرف زدن: گۆترە قسه کردن›.

**کتری** / ketrî ، ـها/: [از انگلیسی] *اسم.* کتری؛ کەتری؛ کەتلی؛ کتریە؛ دەفری کانزایی بە سەرە و دەستە و لوولەوە بۆ تراو تێدا کوڵاندن.

**کت‌شلواری**[1] / kotšalvārî ، ـها/: [انگلیسی/فارسی] *اسم. [گفتاری]* کۆنەسێن؛ فرۆشەری گەڕۆک کە کاری کڕین و فرۆشتنی جل‌وبەرگی کۆن و هەروەها کەل‌وپەلی دەستەدووی ماڵە.

**کت‌شلواری**[2]: *صفت.* کۆت‌وشەڵواری؛ کوت و شواڵ لە بەر ‹عبا و قبا را کنار گذاشت و کت و شلواری شد: عابا و مێزەرەی وەلا نا و بوو بە کوت و شەڵواری›.

**کتف** / ketf/: [عربی] *اسم.* شان؛ شان و پیل؛ دۆش؛ ئەنگل؛ هنگلە؛ هەرمە؛ ستۆ؛ پۆل؛ کووڵ؛ شوو: ۱. شەپیلک؛ سەرپیل؛ ئێسکێکی گەورەی پان و سێ سووچە لە پشتدا پێشەی باسک ڕادەگرێ ۲. ناوشان؛ بەشێ لە پشت، نێوان پشتەمل و سەرشان و ناوقەد.

**کتک** / kotak ، ـها/: [ترکی] *اسم.* کوتەک؛ تێلاکوش؛ تێلاکاری؛ تەپلەکۆ؛ کاری بە دەست یان بە شتێک پەیتا ـ پەیتا لە کەسێک دان بە مەبەستی ئازاندنی.

▣ **کتک خوردن**: کوتران؛ لێدران؛ قوتان؛ هاتنە قوتان؛ کوتش؛ تەپلەکۆ بیەی. هەروەها: **کتک زدن**

**کتک‌کاری** / kotak.kārî ، ـها/: [ترکی/ فارسی] *اسم. [گفتاری]* سۆرەک؛ تێلاتڕێن؛ خەک؛ کۆزەر؛ کۆزەربەر؛ شەق و لەق؛ ڕمکوت؛ کار و ڕەوتی کوتان؛ قوتان؛ لێدان و لێدران.

**کت‌گر** / katgar ، ـها؛ ـان/: *اسم. [قدیمی]* مەرەنگۆز؛ دارتاش؛ چێوتاش؛ چۆتاش؛ نجار؛ نەجار.

**کتل** / kotal ، ـها/: [ترکی] *اسم.* ۱. تەپۆلکە؛ تەپۆکە؛ تەپۆلکە؛ گردووک؛ گردولک؛ قوتکەی سەر زەوی ۲. کۆتەڵ؛ بەیداخی گەورەی ڕازاوە

که به‌تایبه‌ت له تازیه‌باری ئایینیدا هه‌ڵیده‌گرن.

**کتلت** / kotlet، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کوتلیت؛ کوتیلک؛ کوتل؛ خۆراکێ له تێکه‌ڵی گۆشتی چه‌رخکراو، سێفه‌زه‌مینی کوتراو و تۆزێ ئارد که وه‌ک هه‌ویرێکی لێ دێ و پارچه‌-پارچه له ڕۆندا سووری ده‌که‌نه‌وه.

**کتمان** / ketmān/: [عربی]/اسم. که‌تمان؛ که‌تمانه؛ کاری داشاردن؛ شاردنه‌وه؛ داپۆشین؛ وه‌شاردنی شتێ (به‌تایبه‌ت ڕاز) ‹سعی می‌کرد نگرانی‌اش را کتمان کند: تێده‌کۆشا دڵپه‌رۆشیه‌که‌ی داشاری›.

**کتو** / katū/: اسم. که‌ته‌و؛ که‌تو؛ که‌ده‌و؛ نه‌خۆشیه‌کی گیرۆی یه‌کسمانه له سه‌رمای زۆر تووش ده‌بن.

**کت و کلفت** / kat-o-koloft/: صفت. [گفتاری] پان‌وپۆڕ؛ قوت‌وقه‌وی؛ قت (و) قایم؛ زل و زه‌به‌لاح؛ قه‌وی و قۆڵ؛ به ئه‌ستووری زۆرتر له ڕاده‌ی ئاساییه‌وه.

**کت و گنده** / kat-o-gonde/: صفت. [گفتاری] پان و پۆڕ؛ پان و پڕ؛ گه‌پ؛ که‌ت؛ زل؛ زه‌لام؛ زلام؛ به بارستایی یان گۆڤده‌ی زۆره‌وه ‹چوب کت و گنده؛ آدم کت و گنده: چێوی پان و پۆڕ؛ مرۆی پان و پڕ›.

**کته** / kate/: اسم. ١. که‌ته؛ وشکه‌پلاو؛ مه‌که‌ش؛ برنجێ که بێ نانه‌شان و ئاوکێش‌کردن لێنراوه ٢. ـها/ [معماری] پێکهاته‌یه‌ک له برێ ماڵی کۆندا به شێوه‌ی جێگایه‌ک له ژێر سه‌کۆی ئاشپه‌زخانه بۆ هه‌ڵگرتنی پێته‌وای پێویستی ماڵ (وه‌ک ده‌فر و ئاوکێش و...) ٣. که‌ت؛ که‌ته‌؛ ده‌فری قووڵ و ده‌م ئاوه‌ڵا بۆ جێگه‌ی ئاردی نانه‌وا ٤. هێشخان؛ خه‌ڵوه‌تی؛ وچخانه‌؛ هه‌مارێکی چکۆله بۆ جێی سوخاڵ و دار و... له ماڵانی پێشوودا.

**کتیبه** / katībe، ـها/: [از عربی]/اسم. که‌تیبه: ١. نووسراوی زۆر قه‌دیم له سه‌ر به‌رد ٢. نووسراوه‌ی له سه‌ر به‌رد، کاشی، ئاجۆر یان کانزا ٣. [معماری] نیوچه‌غزی سه‌ر ده‌رگا و په‌نجه‌ره به شێوه‌ی کاشیکاری، ئاجۆرچنی یان به گێچ، بۆ جوانی.

**کتیبه‌ای** / katībe'ī/: [از عربی] صفت. که‌تیبه‌یی؛ وه‌کوو که‌تیبه.

**کتیر** / katīr، ـها/: اسم. [قدیمی] تراویلکه؛ له‌یلان؛ هاڵ؛ ئاونما؛ به‌رده‌ڕێژگه؛ دیمه‌نی درۆینه‌ی ئاو له بیاواندا.

**کتیرا** / katīrā/: [سریانی]/اسم. که‌تیره؛ که‌تیرا؛ کتره؛ جه‌باری؛ شیله‌ی زه‌رده‌گوێنی؛ جه‌وی ساقه‌ته‌ی تاقمێ گه‌ون، که له کۆتایی به‌هاردا به خۆیه‌وه یان به له‌له دان دێته ده‌ره‌وه و وشک ده‌بێته‌وه، بۆ ده‌رمان ده‌شێ و له پیشه‌سازیدا به کار ده‌چێ، هه‌روه‌ها ژیلی سه‌ری لێ دروست ده‌که‌ن.

**کثافات** / kesāfāt, kasāfāt/: [عربی] جمعِ ☜ **کثافت**

**کثافت** / kesāfat, kasāfat، ـها؛ کثافات/: [عربی] /اسم. پیسی؛ پیسایی؛ پیساتی؛ چڵک؛ چرک؛ چه‌په‌ڵی؛ قرێژ؛ گه‌مار؛ کێخ؛ ته‌نوایی؛ له‌یم؛ کرێژ؛ کرێش؛ گه‌ند و گرو.

**کثافت‌کاری** / kesāfatkārī, kasāfat-، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. گه‌نه‌کاری؛ چه‌په‌ڵکاری: ١. کار و ڕه‌وتی پیس‌کردنی جێگا یان شتێک ‹دم در کثافت‌کاری کرده بودند: له به‌ر درگا گه‌نه‌کاریان کردبوو› ٢. پیس‌کاری؛ کار یان ئاکارێ که ده‌بێته هۆی پیسی ‹به جای تمیز کردن کثافت‌کاری می‌کند: به جێی خاوێن کردنه‌وه پیس‌کاری ده‌کا› ٣. [مجازی] کار و کرده‌وه‌ی دوور له مرۆڤایه‌تی ‹با این کثافت‌کاری آبروی ما را می‌بری: به‌م گه‌نه‌کاریانه‌ت ئابروومان ده‌به‌ی› ٤. به نه‌زانی کارێک ده‌س پێوه‌دان و تێکدانی، به‌تایبه‌ت ئه‌گه‌ر دیمه‌نێکی ناشیرین و پیس و پۆخڵ به‌دی بێنێ. هه‌روه‌ها: **کثافت‌کاری کردن**

**کثرت** / kesrat, kasrat/: [عربی] *اسم.* زۆری؛ زێدی؛ زەوەندی؛ زەبەندی؛ فرەیی؛ فریەیی ‹کثرت کار: زۆری کار›.

**کثرت گرایی** / kesratgerāyî, kasrat-/: [عربی/ فارسی] *اسم.* فرەخوازی: ١. ڕێبازێ کە بڕوای بە زۆرتر لە دوو ڕاستەقینەی سەرەکی هەیە ٢. ڕێبازێکی رامیاری خوازیاری کۆمەڵگای وا کە هەموو کەسێک بە هەر جۆرە بیر و بۆچوونێک، لە سەر هەر مەرام و ئایینێک و خاوەن هەر زمان و فەرهەنگێک، ڕێی هەبێ بیر و بۆچوونی خۆی دەربڕێ و بەشی خۆی لە کۆمەڵگاکەیدا چالاکی هەبێ: **اصالت کثرت؛ جمع گرایی؛ پلورالیسم**

**کثیر** / kasîr/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* زۆر؛ فرە؛ فریە؛ فراوان؛ زاف؛ زیاد؛ زێدە؛ زەحف؛ مشە؛ مشەمەر؛ ئێجگار؛ یەکجار ‹جمعی کثیر گرد آمده بودند: خەڵکێکی زۆر کۆ ببوونەوە›.

**کثیرالاضلاع** / kasîrol'azlā' ، ـها/: [عربی] *اسم.* *[هندسه]* چەندپەل؛ چەندلابەر؛ چەن‌بەر؛ چەن‌سووچ؛ بیچمی هەندەسی بەسراوە کە لە پێنج هێڵ یان زۆرتر دروست بووە.

**کثیرالانتشار** / kasîrol'entešār/: [عربی] *صفت.* پرتیراژ؛ بە ژمارەی زۆرەوە.

**کثیرالاولاد** / kasîrol'owlād, -o:lād/: [عربی] *صفت.* خێزانبار؛ خاوەن منداڵی زۆر.

**کثیرالتألیف** / kasîrotta'lîf/: [عربی] *صفت.* خاوەن نووسراوەی زۆر.

**کثیرالجمله** / kasîrolcomle, -ccomle/: [عربی] *اسم.* *[ریاضی]* چەندڕستەیی؛ ڕستەیەکی گەورەی بیرکاری کە لە چەند ڕستە پێک‌هاتووە.

**کثیرالملـه** / kasîrolmelle/: [عربی] *صفت.* چەندنەتەوەیی؛ فرەنەتەوە ‹کشور کثیرالملە: وڵاتی چەندنەتەوەیی›.

**کثیرالوجوه** / kasîrolvocûh, -vucûh/: [عربی] *اسم.* چەندپاڵوو؛ بیچمی هەندەسی بە زۆرتر لە چوار ڕووبەرەوە.

**کثیف** / kasîf/: [عربی] *صفت.* پیس؛ گلاو؛ چەپەڵ؛ گەمار: ١. چلکن؛ چرکن؛ پۆخل؛ پۆخڵ؛ زیرگن؛ چرگەن؛ چرکین؛ گنار؛ پەلۆخ؛ ناپوخت؛ تەنوا؛ ژەژ؛ قرێژ؛ قەرێژ؛ قلێر؛ قەلێر؛ قز؛ نەپاک؛ کەسیف؛ چەقلە؛ لیتۆکە؛ ڕیقن؛ گەڤار؛ گەن؛ گەندلخە؛ گۆڵ ‹دست کثیف؛ لباس کثیف: دەستی پیس؛ گنجی چلکن› ٢. *[مجازی]* لەوت؛ پنجل؛ کۆتی؛ گلاف؛ خاوەن ئاکاری نەگونجاو و دوور لە مرۆڤایەتی ‹آدم کثیف؛ موجود کثیف: مرۆی پیس؛ بوونەوەری کلاو›.

▣ **کثیف شدن:** سەنمین؛ هەڕمین؛ لەوتان؛ لەوتین؛ پیس/ چەپەڵ بوون؛ گلاو بوون ‹دستم کثیف شد: دەستم پیس بوو›.

**کثیف کردن:** سەنماندن؛ هەڕماندن؛ چەپەڵ کردن؛ لەوتاندن؛ گەنانن؛ پیس‌کردن؛ ڤەزختاندن.

**کثیفی** / kasîfî/: [عربی] *اسم.* پیسی؛ گەماری؛ چلکنی؛ چەپەڵی؛ ناپاکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی پیس و پۆخڵ بوون ‹انگار بعضیها از کثیفی خوششان می‌آید!: وا دیارە بڕێک وازیان لە پیسیە!›.

**کج**[۱] / kac/: *صفت.* لار؛ گێڕ: ١. چەوێل؛ چەوت؛ چەفت؛ هەلەک؛ خوار؛ قیچ؛ ڤیچ؛ فیچ؛ خێچ؛ کەچ؛ کەج؛ کەفچ؛ لەنگ؛ تیل؛ تیڵ؛ کەمچ؛ چەپ؛ چەپت؛ چەبت؛ خوەهر؛ خوهر؛ خوێل؛ هەل؛ خار؛ دۆلکان؛ هێل؛ هویەل؛ شەف؛ ڤال؛ وار ‹کج کردن: لار کردن› ٢. وێڕ؛ خوار؛ وار؛ بە شێوە و بیچمێکی نائاسایی و نەخوازراو ‹دهنش کج شد: دەمی لار بووە› ٣. خوار؛ بە خاڵگەلێک کە لە یەک ڕاستادا نین ‹دیوار کج؛ چوب کج: دیواری خوار؛ چێوی لار› ٤. *[مجازی]* نادروست ‹دست کج: دەستی لار› ✽ **کژ** *[ادبی]*

▣ **کج افتادن:** *[مجازی]* کەوتنە قینەوە؛ نەیار بوون.

**کج تا کردن:** *[مجازی]* لار جووڵانەوە؛ خراپ

هاتنه پێشەوە؛ بەدکرداری‌کردن ‹با مردم کج تا می‌کرد: لەگەڵ خەڵکدا لار دەجوولایەوە›.

**کج رفتن:** خوار/ لار ڕۆیشتن؛ چەوت چوون: ١. لارەلار بە ڕێدا چوون ٢. *[کنایی]* ناڕاستی و نادروستی‌کردن؛ بە ڕاستەڕێدا نەچوون.

**کج شدن:** داهاتن؛ خوار بوون؛ خار بین؛ لار بوون؛ خوار/ لار بوونەوە؛ خوار و خێچ بوون؛ داکەتن؛ لەپین؛ چەوتانەوە؛ بە لادا هاتن؛ لە دۆخ یان درێژایی ئاسایی دەرهاتن ‹چوب‌پرده کج شده بود: چێوپەردەکە داهاتبوو›.

**کج کردن:** قۆپاندن؛ لارکردنەوە؛ لارکردن؛ لارەوکردن؛ خمانن؛ لارەوەکەردەی؛ لارکەردەیوە؛ خوارکردن؛ گێڕ کردن؛ داهێنانەوە؛ چەفت کردن؛ نۆمەتش.

**کج گذاشتن:** لار دانان؛ لار نیای؛ کەچ دانیان ‹پایم را کج گذاشتم، نزدیک بود بیفتم: پام لار دانا، وەخت بوو بکەوم›.

**کج نگاه کردن:** *[مجازی]* لاچیر لێ‌کردن؛ تیر لێ‌بردنەوە؛ لار لێ‌ڕوانین؛ لاخێس ڕوانین؛ لار تواشا کردن؛ لە سەر تووڕەیی یان بە نیازی خراپەوە ڕوانین ‹کسی نمی‌تواند به تو کج نگاه کند: کەس ناتوانێ لاچیرت لێ بکا›.

**کج ـ[2]:** *پیشوازه.* ـ چەوت؛ چەوت ـ ؛ لار ـ ؛ ـ لار؛ خوار ـ ؛ گێڕ ـ ؛ چەوێڵ؛ بە دۆخی نالەبار و ناحەزەوە ‹کج‌اندیش: بیرچەوت›.

**کجا[1]** / koca/: *قید.* کوێ؛ کۆ؛ کوو؛ کوورە؛ کوێنە؛ کۆگە؛ کوینە؛ کوێندەرێ؛ کوێندەر؛ کوێن؛ کۆمجا؛ کۆش؛ کۆتا؛ کام‌شوێن؛ کانجا؛ کین؛ کێن؛ کێندەر؛ کێندەرێ؛ کام‌جێ: ١. لە کوێ؛ چکۆ؛ کووش؛ کوەنە؛ کاتا؛ کدێ؛ لکیدەرێ؛ لە کوو؛ لە کام جێدا ‹کجا می‌خوابی؟: لە کوێ دەخەوی› ٢. کوە؛ کوەوە؛ کوێوە؛ کوێدا؛ کوێیا؛ کویڤە؛ ئەنەکۆ؛ کوێدەرێ؛ بۆ کوێ؛ بۆ کام جێ؛ بە کام جێدا ‹کجا می‌روی؟؛ کجا بردەاند؟: کوێ دەچی؟؛ بردوویانە بۆ کوێ؟› ٣. کوە؛ هیچ کوێ ‹کجا را دارم بروم؟؛ کجایش را دیده‌ای؟: کوێم هەیە بڕۆم؟؛ کوێنەت دیوە؟› ٤. لەکوێ؛ کەی؛ کەنگێ؛ چکۆ؛ کوا؛ کووش؛ نیشانەی بەرهەڵستی، دژایەتی یان حاشا ‹پول کجا بود؟؛ کجا همچو حرفی زدم؟: پووڵ لەکوێ بوو؟؛ کەی وام گوتووە؟›.

▣ **کجا را داشتن:** کوێ هەبوون؛ کوێنە بوون؛ بێ‌جێ‌وڕێ بوون ‹آن وقتِ شب کجا را داشتم که بروم؟: ئەوجار شەو کوێم هەبوو بڕۆم؟›.

**کجا را گرفتن:** *[کنایی]* بە کوێ گەیشتن؛ هیچ نەکردن؛ کار لێ پێش نەچوون ‹گفت: این همه درس خواندی، کجا را گرفتی؟: گوتی: ئەم هەمووە دەرسەت خوێند بە کوێ گەیشتی؟›.

**کجایش را دیدن:** جارێ/ هێشتا/ تازە کوێ دیتن؛ ئێستا جارێ باش نەبینین ‹گفتم: عجب شهر قشنگی است! گفت: «کجایش را دیده‌ای؟»: گوتم: چەند شارێکی جوانە! گوتی: «جارێ کوێت دیوە؟»›.

**کجای کاری بودن:** *[مجازی]* لە کوێ بوون؛ بێ‌خەبەر بوون ‹کجای کاری؟ آزاد یک سال است که از اینجا رفته: لە کوێی؟ ئازاد ساڵێکە لێرە ڕۆیشتووە›.

**کجا[2]** / ـها/: *ضمیر.* کوێ؛ کوێندەرێ؛ کوێن؛ کین؛ کۆگە؛ کوورە؛ کۆ؛ کوێنە؛ کانێ؛ وشەی پرسیار بۆ جێگا ‹اینجا کجاست؟: ئێرە کوێیە؟›.

**کجائی** / koca'î/ ☜ **کجایی**

**کج‌اندیش** / kacandîš ، ـان/: *صفت. [مجازی]* بیرچەوت؛ خاوەن تێفکرین یان بیری نادروست و نەگونجاوەوە.

**کج‌اندیشی** / kacandîši ، ـها/: *اسم. [مجازی]* بیرچەوتی؛ ڕەوتی بیرکردنەوە بە شێوەی نادروست و نەگونجاو.

**کجاوە** / kacave ، ـها/: *اسم. [قدیمی]* کەژاوە؛ کەجاوە؛ مەئافە؛ تەڵمیت؛ هۆدەیەک بە سێبەرەوە بۆ دانیشتنی مسافر کە بە چوارپێ

ئەنقەستی تاقمێ ‹کشتار مردم بی‌گناه: کوشتاری خەڵکی بێ‌تاوان› ٢. کار و ڕەوتی سەر بڕینی چوارپێیان و باڵندە، بۆ کەڵک‌گرتن لە گۆشتیان.

**کشتارگاه** / koštārgāh ، ـها/: /اسم. کوشتارگە؛ قەساوخانە؛ قەسابخانە؛ جێگای سەر بڕین، قەڵخ کردن، دەرهێنانی ناو سک، لەت ـ لەت‌کردن و بەستەبەندی گۆشتی چوارپێیانی وەک گا و پەز و بزن، بە ئامراز و کەرستەی تایبەت: **سلّاخ‌خانه** *[قدیمی]*

**کشتبان** / keštbān ، ـها؛ ـان/: /اسم. پاسەوانی کێڵگە؛ دەشتەوان؛ ئاگاداری مووچە و مەزرا.

**کشتزار** / keštzār ، ـها؛ ـان/: /اسم. *[ادبی]* کێڵگە؛ هێگا؛ مووچە؛ مەزرا؛ یادگە؛ کێشت؛ زەوی‌زار؛ زەوی‌وزار؛ زەوینێ کە تووی تێدا دەکێڵێن، بەتایبەت جێ کێلانی گیای ئالیکی (وەک دانەوێڵە).

**کشتکار** / keštkār ، ـها/: /اسم. *[ادبی]* تووچێن؛ تۆم‌وەشێن؛ کەسێ کە کاری چاندنی تووی کشت و کاڵە: **کشتگر**

**کشتگر** / keštgar/ ☜ **کشتکار**

**کشتگرد** / keštgard/: /اسم. *[کشاورزی]* وەرزەکێڵ؛ وەرزان‌وەرز؛ کار و ڕەوتی گۆڕانی تۆمێ کە لە زەوینێکدا دەکێڵدرێ بۆ گووڕانی خاک، لە ناو بردنی بژار و...

**کشتن** / keštan/ ☜ **کاشتن ـ ١**

**کشتن** / koštan/: *مصدر متعدی.* // **کشتی:** کوشتت؛ **می‌کشی:** دەکوژی؛ **بکش:** بکوژە// کوشتن؛ کوژتن؛ کوژین؛ گوژتن؛ گوژان؛ کوشتەی؛ کشتش؛ کستەنە: ١. مراندن؛ ئەوژەنین؛ بێ‌گیان‌کردن؛ کۆتایی هێنان بە ژیانی گیانەوەرێک ‹کشتن یک مورچه هم آسان نیست: کوشتنی مێرووبەکیش هاسان نیە› ٢. لە بەین بردنی هەست یان چالاکیەکی زەینی یان عاتیفی ‹ترس را کشتن؛ شادی را کشتن: ترس کوشتن؛ خۆشی کوشتن› ٣. *[ادبی]* کوژاندنەوە؛ تەمراندن؛ ڤەمراندن؛ کوشنایوە؛ ئەوەکوشنەی؛ ئەرەمرنەی. هەروەها: **کشتنی**

■ صفت فاعلی: **کُشنده** (کوژەر)/ صفت مفعولی: **کُشته** (کوژراو)/ مصدر منفی: **نَکُشتن** (نەکوشتن)

**کشت‌وصنعت** / kešt-o-san'at/: [فارسی/ عربی] /اسم. ١. کار و ڕەوتی بەدیهێنان و ئامادەکردنی داهاتی کشت‌وکاڵ بە کەڵک‌گرتن لە زانست و کەرەسەی پیشەیی ٢. /ـها/ ڕێخراوەیەک کە بەم کارەوە خەریکە.

**کشت‌وکار** / kešt-o-kār ، ـها/: /اسم. کشت‌وکار؛ کشت‌وکاڵ؛ کەشت‌وکاڵ؛ کشت‌وکێڵ؛ کشت‌کێڵ؛ چالاکی کەشاوەرزی.

**کشت‌وکشتار** / košt-o-koštār/: /اسم. قەڵت‌وبڕ؛ کوشت‌وبڕ؛ کوشت‌وکوشتار؛ کارەڕەهاتی کوشتنی خەڵکێکی زۆر ‹مردم هنوز کشت‌وکشتار جنگ را به یاد دارند: خەڵک ئێستاش قەڵت‌وبڕی شەڕەکەیان لە بیرە›.

**کشته**/ kešte/: /اسم. *[ادبی]* کاشت؛ چاندراو؛ کێڵاو؛ کێڵدراو؛ کێڵیاگ؛ تووی لە زەوی چێندراو.

**کشته** / košte/: *صفت.* کوشتە: ١. /ـها؛ ـگان/ کوژراو؛ کوژیاو؛ کوژاو؛ کوژیاگ؛ کوشیا؛ کشتا؛ کشیایا؛ کشیایە؛ مریندراو؛ کوشتوو؛ بە کوشت چوو ‹چند کشته و زخمی داشتیم: چەن کوژراو و بریندارمان بوو› ٢. لە هێزکەوتوو ‹آهک کشته: قسلی کوشتە› ٣. کوژراو؛ کوژیاو؛ کوژاو؛ کوشیا؛ کوژیاگ؛ لە کایە دەرچوو بە دەستی هامبازەوە (لە برێ یاری وەک شەترەنج و تەختەدا).

▣ **کشته شدن:** کوژران؛ کوژیان؛ کشیایش؛ کوشیەی؛ کوشیای؛ هاتنە کوشتن؛ گیان لە لەش دەرچوون.

**کشتی** / keštî/: /اسم. کەشتی؛ کەشتیە: ١. /ـها/ گەمی؛ گەمیە؛ گەمێ؛ سوماری؛ پاپۆڕ؛ ئامێری پێڕاگوێزی گەورە، بەتایبەت بە عەرشە، کابین، هەمار و هەموو ئامێرێکی تایبەتەوە بۆ کار و

پشـووداني دەرياوانـان و مسـافران ٢. *[نجـوم]* گـەورەترين وێنـەی ئاسمـانی لـە لەتـەگۆی باشووريدا: **سفينه**

▣ **کشتی اتمی:** کەشتی ئەتومی؛ گەمیەیەک کە هێزی موتورەکەی لە قەڵشی نـاوەکی ئـەتوم بە دەست دێ.

**کشتی بادبانی:** کەشتی باژۆ؛ کەشتی بايەوانی؛ کەشتی بادەوەدار.

**کشتی باری:** کەشتی باری؛ گەميـەی تايبـەت بۆ گواستنەوەی بار.

**کشتی بخار:** کەشتی هەڵم؛ گەمیەیەک کە بە هێزی هەڵم کار دەکا.

**کشتی پارویی:** کەشتی پـاروويی؛ گەميەيـەک کە بە پاروو لێدان لە سەر ئاودا دەڕوا.

**کشتی جنگی:** ناو؛ کەشتی جـەنگی؛ گەميـەی شەڕی.

**کشتی فضایی:** ناو کيهانی ☜ **ناو**

**کشتی مسافری:** کەشـتی مسـافری؛ گەميـەی تايبەتی ڕاگواستنەوەی مسافر.

**کشتی نفتکش:** کەشتی نەوت‌کـێش؛ گەميـەی تايبەتی ڕاگواستنەوەی نەوت.

**کشتی نوح:** *[کنـايی]* گەميەی نووح؛ توورەکەی سواڵکەر؛ تريتی شێت؛ جێگايەک کە کەسـان يان بوونەوەرانی تێکەڵ-پێکەڵی ناتەبايان تێدا کۆ بۆتەوە.

**کشتی هواپيمابر:** ناو هواپيمابر ☜ **ناو**

**کشـتی** / koštî ، ـهـا/: *اسـم.* زۆران؛ زۆرەبـانی؛ زۆرەبانێ؛ زۆرانی؛ بنکەفشانێ؛ عـەردانێ؛ ملانـە؛ ململانە؛ ململانـێ؛ گولـەش؛ گـوراش؛ گـولاش؛ گـــەمش؛ گمـــش؛ دەفـــرە؛ عـــەفرە؛ کۆچـــە: ١. وەرزشێکی دوو کەسيە هەر کەس ئەوی‌تری بە زەويدا دا بردوويەتەوە ٢. *[مجازی]* تێکۆشان و خـەباتی تـەنی يـان زەيـنی زۆر دژوار ‹از صبح داشت با کولر کشتی می‌گرفت: لـە بەيانيـەوە خـەريک بوو لەگەڵ کووليرەکەدا زۆرانـی دەگرت›.

▣ **کشتی گـرفتن:** زۆران گـرتن؛ زۆران گێرتـەی؛ زۆرەبانێ‌گرتن: ١. بۆ بە زەويـدا دانی يـەکتر، ئاوقای يەک بـوون ٢. *[مجـازی]* گێرەوکێشـە/ بەرەبەرەکانێ‌کردن؛ تێـک هەڵـچرژان؛ پێـک هەڵپرژان؛ شەڕکردن.

**کشتيار** / koštiyār/: *صفت.* پێ‌داگر؛ پێ‌چەقێن.

▣ **کشتيار کسی شدن:** پێ لە کەسێک داگـرتن ؛ داکۆکی لە سەر کەسێک کردن ‹چقدر کشـتيار دخترم شدم، بلکه به اين کـار رضـايت دهـد: چەنـدە پێم لە کچەکەم داگـرت، بەڵـکوو مـل بـەم کـارە بدا›.

**کشـــتيبان** / kaštîbān ، ـان/: *اسـم. [ادبـی]* کەشتيەوان؛ کەشتيوان؛ کەشتيڤان؛ پـاپۆڕەوان؛ پاپۆڕوان؛ گەميەوان؛ گەميوان؛ گەمێوان؛ ناخودا؛ زريڤان؛ زريوان؛ ئەوەی کە کەشتی داژوێ.

**کشـــتيدم** / keštîdom/: *اسـم.* ١. *[نامتـداول]* قنگەکەشتی؛ کلکی کەشتی ٢. *[نجوم]* بەشێ لە وێنەی ئاسمانی کەشتی لە نێوان سەگی گـەورە و خـاچی باشـووری لـە ئاسمـانی لەتـەگۆی باشووريدا: **حمّال**

**کشـتيرانی** / keštîrānî/: *اسـم.* ١. زانسـت يـان لێزانی بـەڕێوە بـردنی گەميـە ٢. کـار و ڕەوتی ئـاژۆتنی کەشـتی ٣. ڕاگواسـتنەوەی بـار يـان مسافر بە ڕێگا يان تـۆڕێکی ديـاريکراوی ئاويـدا ٤. *[ـها]* ڕێخراوەی تايبەتی ئەو کارە.

**کشتی‌گير** / koštîgîr ، ـها؛ ـان/: *اسم.* زۆرەبان‌بـاز؛ زۆران‌بـاز؛ زۆران‌گـر؛ زۆرانی‌گـر؛ کۆچـەگر؛ زۆرەوانی‌گر؛ ملانێ‌کـەر؛ گەمشۆ؛ کوشـتی‌گـير ‹کشـتی‌گير کردسـتانی حريفـان خـود را شکسـت داد: زۆرەبان‌بازی کوردستانی لە هەمبازەکانی بردەوە›.

**کشدار** / kešdār/: *صفت.* کێشـدار: ١. ڤـەکێش؛ بە کـێش؛ درێـژەدار؛ بـە درێـژە ‹صدای کشـدار: دەنگی کێشدار› ٢. *[مجازی]* بۆدار؛ ئاوهەڵگر ‹اين جملـه خيلـی کشـدار اسـت: ئـەم ڕسـتە زۆر بـۆدارە› ٣. گيڕ؛ چڕ؛ چێڕ؛ نەکێش؛ چيڕ ‹جـوراب کشـدار:

گۆرەویی کێشدار›.

**کشسان** / keššān/: *صفت.* کێش‌ئاسا؛ ئیلاستیک؛ بە تایبەتمەندی کێش‌هاتن و چوونەوە سەر دۆخی خۆ.

**کشسانی** / keššānî/: *اسم.* کێش‌ئاسایی؛ تایبەتمەندی ماک بۆ کێش هاتن و چوونەوە سەر دۆخی خۆی.

**کشش** / kešeš/: *اسم.* کێش؛ ڕاکێش؛ ڕاکێشی؛ ڕاکشی: ۱. کار و ڕەوتی کێشان؛ ڕاکێشان ‹قدرت کشش: هێزی ڕاکیشی› ۲. چاوگری؛ تایبەتمەندی شت یان کەسێک کە سەرنج و هۆگرەتی بەرەخۆ دەبا ۳. هۆگرەتی؛ حەز؛ واز ‹نسبت به او در خود هیچ کششی احساس نمی‌کرد: لەمەڕ ئەوەوە هیچ هۆگرەتیەکی لە خۆیدا هەست نەدەکرد› ٤. دۆخی دێران؛ هەڵگرتن و جێ کردنەوە و وەرگرتنی شتێک ‹بازار کشش این‌همه کالا را ندارد: بازار ڕاکێشی ئەم هەموو پیتەوایەی نیە› ۵. دۆخی تەناف، سیم یان میلەیەک کە لە دوو سەرەوە کێشراوە ٦. *[فیزیک]* هێزێ کە تەن لە کاتی کێشرانیدا بە پاڵپشتەکەی دەگەیێنێ.

**کشف** / kašaf، ـها/: *اسم.* ڕەقە؛ ڕەق؛ ڕەقیاو؛ کیسەڵی ئاوی.

**کشف** / kašf، ـها/: [عربی] *اسم.* کار و ڕەوتی دۆزینەوە: ۱. هەڵاوردن؛ ئەوەیۆسەی؛ پێزانینی شتێک کە پێشتر نەزانراوە، بە تێکۆشان و حەولدان (نە هەواڵ و ڕاپۆرتی دیتران) ‹کشف میکروب سل: دۆزینەوەی میکرۆبی سیل› ۲. کار یا ڕەوتی دەرکەوتن یان دەرخستنی ئەوی نادیار بووە یان شاردراوەتەوە ‹کشف جسد: دۆزینەوەی لاشە›.

▣ **کشف ابیات** ☜ **کَشف‌الاَبیات**

**کشف آیات** ☜ **کَشف‌الآیات**

**کشف حجاب:** لابردنی چارشێو و لەچک لە سەر ژنان.

**کشف رمز:** دۆزینەوەی ڕەمز.

**کشف عورت:** دەرکەوتنی شەرم؛ عەیب کەوتەی سارا.

**کشف لغات** ☜ **کشف‌اللغات**

▣ **کشف شدن:** دەرکەوتن: ۱. کەوتنە دەرەوە؛ ئاشکرا بوون؛ کەوتەی بەر؛ کەوتەی سارا؛ ئاشکار بوون ‹حفره‌ای در آنجا کشف شد: چاڵێ لەوێ دەرکەوت› ۲. دۆزرانەوە؛ دۆزیانەوە؛ یۆزیایوە؛ پەیدا بوون ‹در آن مقداری سکه‌ی قدیمی کشف شد: بڕێ سکەی کۆنی تێدا دۆزرایەوە›. هەروەها: **کشف کردن**

**کشف‌الابیات** / kašfol'abyāt/: [عربی] *اسم.* خشتە، پێڕست یان نووسراوەیەک بۆ دۆزینەوەی چامێک لە دیوانی شیعرێکدا.

**کشف‌الآیات** / kašfol'āyāt/: [عربی] *اسم.* خشتە، پێڕست یان نووسراوەیەک بۆ پەیدا کردنی ئایەتێکی قورئان.

**کشف‌اللغات** / kašfolloqāt/: [عربی] *اسم.* خشتە یان پێڕستێ بۆ پەیدا کردنی وشەی ڕەچاوکراو لە نووسراوە یان کتێبێکدا.

**کشفتن** / košoftan/: *مصدر. لازم. متعدی. [قدیمی]* □*لازم.* ۱. ژاکان؛ چرمسین؛ چلمسین؛ چەلمسین؛ گەچران؛ چزمرین؛ چلمیسان؛ سیسیان؛ گەچلان؛ پەرمووچان □ *متعدی* ۲. پژاندن؛ پەرژ و بلاوکردن؛ تێک و مەکان دان.

**کشفی** / kašfî/: [عربی] *صفت. [گفتاری]* دۆزراوە؛ وەدۆزراو؛ دۆزیاوە؛ پەیداکراو، بەتایبەت لەمەڕ ماڵ یان شتی دزراو یان قاچاخەوە ‹اتومبیل کشفی: ماشینی دۆزراوە›.

**کشفیات** / kašfîyyāt/: [عربی] *اسم.* دۆزراوەگەل؛ دۆزراوەیەل؛ دۆزیاوەگەل؛ کۆمەڵی ئەو شتانەی ماوەیەک ون بوون و ئێستا دۆزراونەتەوە ‹کشفیات پلیس: دۆزراوەگەلی پولیس›.

**کشک** / kašk, kašg/: *اسم.* کەشک؛ کەشکی: ۱. چۆرتان؛ لوف؛ شیرێژی بە تەڕی گوشراوی

وشکەوەکراو ۲. *[مجازی]* هیچ‌وپووچ؛ شتی بێ‌هۆ و بێ‌بایەخ.

▣ **کشک خود را ساییدن:** *[کنایی]* قنگ دانە سەر شوالی خۆ؛ دەست بە کلاوی خۆوە گرتن؛ بە ڕێی خۆدا چوون؛ فزوولی نەکردن ‹تا خواست حرفی بزند، پدرش از آن طرف گفت: تو کشک خودت را بساب: هەر کە ویستی قسەیێک بکا، بابی لەو لاوە گوتی: تۆ قنگ بدەرە سەر شوالی خۆت›.

**کشک ساییدن:** کەشک ساوین؛ کەشک ساوینەوە؛ لە ئاودا نەرم‌کردنەوە و ناوینی کەشک.

**کشکاب** / kaškāb/: *اسم. [قدیمی]* ۱. سیراج؛ سیراجی؛ شیرێژ؛ شیراز؛ ژاژی؛ دۆی کولاوی خەست‌هەلاتوو ۲. زورچە؛ کەشکاو؛ کەشکین؛ چێشتی کەشک ۳. کەشکەک؛ هەرمیسە؛ چێشتی گەنمەکوتاو بە گۆشتەوە.

**کشک‌بادنجان** / kaškebādemcān, kašgebādencān/: *اسم.* کەشک‌وباینجان؛ کەشک‌وبامجان؛ خۆراکی باینجانی سوورەوەکراو و پیواز و جار-جاریش گۆشتی چەرخکراو کە پاشان کەشک و نەعناداخی بە سەردا دەکەن.

**کشکرک** / kaškarak, kašgarak/: [از کردی] *اسم.* کلاغ زاغی ☜ **کلاغ**

**کشکک** / kaškak, kašgak/ ☜ استخوان کشکک، **استخوان**

**کشکول** / kaškûl, kašgûl ، ـها/: *اسم.* کەشکۆل: ۱. قاپێلکی جۆرێ میوەی وەکوو نارگیلە دەرویشان دەسگرەی زنجیری لێ دەخەن و دەرۆزەی پێوە دەکەن ۲. کتێبێ کە نووسراوەی کورت و جۆراوجۆری تێدا کۆ کراوەتەوە (وەک شیعر، چیرۆک، قسەی نەستەق، مێژوو، ...) ‹کشکول محمد علی قرداغی: کەشکۆلی محەمەد عەلی قەرەداغی›.

**کشکی** / kaškî, kašgî/: *صفت. [گفتاری، مجازی]* کەشکی؛ درۆیی؛ درۆیینە؛ ناڕاست ‹خبر کشکی: هەوالی کەشکی›.

**کشمش** / kešmeš ، ـها/: *اسم.* کشمیش؛ کشمش؛ کشمیشی؛ کوشمیشی؛ مەویژ؛ مەووژ؛ ئیشکەوەکراوی ترێی بێ‌دەنک.

**کشمکش** / kešmakeš, kešmekeš/: *اسم.* کێشماکێش؛ کەشاکەش؛ کەشماکەش؛ کەشمەکەش؛ کێشی‌نکێش؛ کێشمەکێش؛ کێشەکێش؛ کێشە؛ گێرمەکێش: ۱. کار و ڕەوتی کێشرانی هاوکاتی شتێک بە دەستی دوو یان چەند کەس، هەرکام بە لایەکدا ۲. /ـها/ قەرقەشە؛ خەرخەشە؛ کێشە و بەردە؛ کێشە و بەرە؛ گێرە و کێشە؛ قەرقەش؛ گەلش؛ بگرە و ڤەکێش؛ بگرە و بەردە؛ کێشە و هەرا؛ ناکۆکی هاوڕێ لەگەل شەڕ و قڕە و دژبەرایەتی و...دا ❋ **کشاکش**

**کشمنی** / kešmanî/: *قید. [گفتاری]* کێشانەیی؛ بە کێشانە ‹آقا اینجا شهر هرت است، کتاب را کشمنی می‌فروشند، نخود را دانه‌ای!: کاکە ئێرە هەرکەبۆخۆیە، کتێب بە کێشانە دەفرۆشن و نۆک بە دانە!›.

**کشند** / kašand ، ـها/: *اسم.* هەلکشە و داکشە؛ بان و خوارکردنی نۆبەتی ئاوی سەر گۆی زەوی بە هۆی هێزی ڕاکێشی مانگ و خۆرەوە.

**کشندان** / kašandān/: *اسم.* بەستێن؛ ئاورێژی ڕووبار کە لە ژێر کارتێکەری هەلکشە و داکشەدایە و لەوێدا ئاوی شیرینی چەم و ئاوی سوێری زەریا تێکەل دەبن.

**کشنده** / kešande, kašande/ ☜ **اسب-۴**

**کشنده** / košande ، ـها/: *صفت.* کوژەر؛ کوشندە؛ کوشنە؛ بکوژ؛ کوژەک؛ کوژنە؛ کوژندە؛ کوژە؛ مرۆک؛ بە تایبەتمەندی و توانایی کوشتن ‹زهر کشنده: ژاری کوژەر›.

**کشو** / kešow, kešo: ، ـها/: *اسم.* کەشاو؛ کەشاف؛ کەشەو؛ چەکمەجە؛ جابەیەکی سەرباز لە نێو قەفەسە، کومید یان مێزدا کە دەر و ناو دەکا.

**کشوت / kašûs/:** [معرب از آرامی] ☜ **آفتیمون**

**کشور / kešvar**، ـها/:*اسم.* ولات؛ وەلات؛ کیشوەر؛ یەکەی سیاسی و جوغرافیایی بریتی لە جێگایەک بە دەوڵەت و پاتەخت و نەتەوەیەکەوە کە تێیدا دەژین ‹کشور آلمان: ولاتی ئاڵمان›.

**کشورداری / kešvardārî**، ـها/:*اسم.* ولاتداری؛ وەلاتداری؛ زانست، فەن یان شێوازی بەڕێوەبردنی ولاتێک.

**کشورگشایی / kešvargošāyî**، ـها/:*اسم.* ولاتداگری؛ کار و ڕەوتی داگیرکردن و دەست بە سەردا گرتنی ولاتانیتر.

**کشوری / kešvarî/:***اسم.* ولاتی؛ حوکوومی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە ولاتەوە ‹تقسیمات کشوری: دابەشکاری ولاتی› ۲. ناچەکداری ‹کشوری و لشکری: ناچەکداری و چەکداری›.

**کش‌وقوس / keš-o-qows, -qo:s/:** [فارسی/عربی]*اسم.* ۱. تروکێش؛ کاری خۆ کێشانەوە؛ پێچدان و ڕەپ‌کردنی لەش بۆ دەرکردنی ماندوویەتی ۲. گیروداو؛ دۆخی بگۆڕ لە ڕەوتێکدا (وەک بگرە و بەردە، پشتگری و دژایەتی، شەڕ و ئاشتی پەیتا- پەیتا) ‹کش و قوس مقررات اداری: گیر و داوی یاسای مەزرینگەیی›.

**کش‌وواکش / keš-o-vākeš/:***اسم.* *[گفتاری]* کەشاکەش؛ کەشماکەش؛ کێشماکیش؛ کەشمەکەش؛ خەرخەشە؛ کێشەکێش.

**کشوی**[1] **/ kešovî**، ـها/:*اسم.* دراویر؛ کەشاوی؛ مجەر؛ مجەڕ؛ چەشنێ کومیدی تەنیا بە چەند کەشاوەوە: **کشویی**

**کشوی**[2]: *صفت.* کەشاوی؛ کەشەوی؛ چەکمەجەیی؛ لە بار بۆ دەر و ناو کردن ‹در کشوی: درگای کەشاوی›: **کشویی**

**کشویی / kešoyî/** ☜ **کشوی**

**کشی**[1] **/ kešî/:** *صفت.* کێشی: ۱. بە کێش ‹آب‌نبات کشی: شەکرۆکەی کێشی› ۲. کەژی؛ وەکوو کێش ‹جوراب کشی: گۆرەویی کەژی›.

**ـ کشی**[2]: *پیوازە.* ـکێشی؛ کێشان ‹خط‌کشی: هێڵ‌کێشی›.

**ـ کشی / košî/:** *پیوازە.* ـکوژی؛ ـکوشی؛ کوشتن ‹آدم‌کشی: مرۆکوژی›.

**کشیدگی / kešîdegî, kašîdegî/:***اسم.* ۱. زراڤی؛ هەڵکشاوی؛ بەرزی؛ بڵیندی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بە قەد و باڵا بوون ‹کشیدگی قامت: زراڤی بەژن› ۲. کێشراوی؛ ڕاکشاوی؛ درێژی ‹کشیدگی صدا: کێشراوی دەنگ›.

**کشیدن / kešîdan, kašîdan/:** *مصدر. متعدی، لازم. //* **کشیدی:** کێشات؛ **می‌کشی:** دەکێشی؛ **بکش:** بکێشە// کێشان؛ کێشتەی؛ کێشەی؛ کیشیاین: □*متعدی.* ۱. دەرهێنان؛ دەرینان؛ دەرهاوردن؛ بەرئاردەی؛ هۆرکێشتەی؛ هەڵکێشان؛ لە جێی خۆ دەرهێنان ‹دندان کشیدن: ددان کێشان› ۲. نگارین؛ نەخش‌کردن ‹نقاشی کشیدن؛ خط کشیدن: نەقاشی کێشان؛ هێڵ کێشان› ۳. پۆشاندن؛ داپۆشان؛ داپۆرەی؛ پۆرەدای ‹پرده کشیدن: پەردە کێشان› ٤. لادان؛ لابردن؛ داکێشان ‹روبندش را کشیدم: ڕووبەندەکەیم لادا› ۵.کێشانەکردن؛ سەنگ‌کەردەی ‹گندم کشیدن: گەنم کێشان› ٦. تێکردن؛ داکردن؛ کردنە نێو دەفرەوە ‹غذا کشیدن: چێشت تێکردن› ۷. ڕاکێشان؛ هەڵمژین؛ بەرەوخۆ کێشان ‹این بادنجان همەی روغن را کشید به خودش: ئەم باینجانە هەموو ڕۆنەکەی ڕاکیشایە خۆی› ۸. هەڵکردن؛ هەڵگرتن ‹درد کشیدن؛ سختی کشیدن: ئێش کێشان؛ سەخڵەتی کێشان› ۹. شتێک بە گوشارەوە بەرەو خۆ هێنان ‹موی کسی را کشیدن: قژی کەسێک کێشان› ۱۰. کاری هاوکرد: *الف)* بردن یان گواستنەوە ‹بار کشیدن: بار کێشان› *ب)* شیلاوی شتێک گرتن ‹روغن کشیدن: ڕۆن کێشان› *ج)* لێدان؛ دان؛ ڕووپەڕێ بە ماڵینی شتێک پاک کردنەوە ‹جارو کشیدن؛ کیسە کشیدن: گسک

دان؛ کیسە کیشان› د) دروست کردن یان بەدیهێنانی شتێک لە یەک ڕاستەدا ‹خیابان کشیدن: شەقام کیشان› هـ) دووکەڵ بردنە نێو زار و گەرووەوە ‹سیگار کشیدن: سیگار کیشان› و) شتێک بە سەر ڕووپەڕێکدا هێنان ‹دست بر سر کسی کشیدن: دەست بە سەر کەسێدا کیشان› ز) سەرقاڵ کردن بە کارێکەوە ‹بە کار کشیدن: کیشانە ژێر کارەوە› ح) تێوەدان؛ لەوتاندن؛ هەڕماندن ‹بە گند کشیدن: گوو تێوەدان› ط) دانە بەر؛ گرتنە ژێر؛ لە بەر شتێکی ئازاردەردا دانان ‹بە فحش کشیدن: دانە بەر جنێو› ی) بە شتێکەوە کردن ‹بە سیخ کشیدن: بە سێخەوە کردن› ◻لازم. ۱۱. کوێرەوەری دیتن ‹هرچە می‌کشیم از دست خودمان است: هەرچی دەکیشین لە خۆمانە› ۱۲. خایاندن؛ تێپەڕ بوون؛ بردن؛ بە سەر چوون ‹مسافرتم فقط دو هفتە طول کشید: سەفەرەکەم تەنیا دوو حەوتەی خایاند› ۱۳. کاری هاوکرد: *الف)* لێدان؛ دان؛ دەنگی بەرز و درێژەدار دەرهێنان ‹نعرە کشیدن: نەعرەتە لێدان› ب) کێشیان؛ درێژەدار/ بە درێژە بوون؛ خایاندن ‹بە درازا کشیدن: درێژەدار بوونەوە› ج) دڵ پێوە بوون ‹عشق کسی کشیدن: دڵی کەسێک پێوە بوون› د) دیتن؛ لە بەر ڕەنج و ئازارەوە بوون ‹بدبختی کشیدن: چەرمەسەری کیشان› هـ) گەیین؛ بە ئاکامێک گەیشتن ‹بە دعوا کشیدن: کیشانە شەڕ›.
هەروەها: **کشیدنی**

■ صفت فاعلی: **کشندە** (کێشەر)/ صفت مفعولی: **کشیدە** (کێشراو)/ مصدر منفی: **نکشیدن** (نەکیشان)

**کشیدە**[1] / kešîde ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* زللە؛ زیللە؛ زلـە؛ چەپلاخە؛ چەپلاغە؛ چەپالە؛ کەشیدە؛ کەشیلە؛ کەشیدێ؛ کەشیە؛ چەک؛ شرن؛ شرماپ؛ شەقام؛ شەپازلە؛ شەقەزلە؛ شەپەزللە؛ شەقەزللە؛ شەپاڵ؛ شەپالە؛ شەپەلاخە؛ شەپلاغە؛ شەپلاخ؛ شەپلاخە؛ شەپیلە؛ لامات؛ دەخش؛ سەترە ‹یک کشیدەی محکم خواباند بیخ گوشم: زللەیەکی توندی دا بناگوێما›.

**کشیدە**[2]: *صفت.* زراڤ؛ کێشراوە؛ هەڵکشاو؛ درێژ؛ بڵیند ‹قامت کشیدە: بەژنا زراڤ›.

**ـکشیدە**[3]: *پیوازە.* ـ دیتوو؛ ـ چەشتوو؛ شتێکی ئازاردەر بە سەردا هاتوو ‹بلاکشیدە؛ ستم‌کشیدە: بەلاچەشتوو؛ ناحەقی دیتوو›.

**کشیش** / kešîš ، ـها؛ ـان/: [سریانی]/*اسم.* قەشە؛ کەشە؛ کەشیش: ۱. مەلای خاچپەرستان (بە گشتی) ۲. کەسێ کە پلە و پایەی سەرتر لە شەمماس و خوارتر لە ئوسقوفە.

**کشیش‌نشین** / kešîšnešîn ، ـها/: [سریانی/ فارسی] /*اسم.* کەشەنشین؛ ئاقاری کار و چالاکی قەشەیەک.

**کشیشی** / kešîšî/: [سریانی]/*اسم.* کەشەیی؛ قەشەیی؛ کار و پلەی کەشیش.

**کشیک** / kešîk ، ـها/: [ترکی]/*اسم.* کێشک؛ هێشک؛ ئێشک؛ پاس: ۱. نگابانی؛ پاسەوانی ‹کشیک دادن: کێشک دان› ۲. نگابان؛ دیاردی؛ پاسەوان ‹کشیک شب: ئێشکی شەوانە› ۳. نۆبەت؛ چاوەدێر و ئاگادار بەتایبەت لە شەواندا ‹پزشک کشیک: بژیشکی کێشک›.

◘ **کشیک بودن:** کێشک بوون؛ ئێشک بوون؛ وەئەستۆ بوونی ئاگاداری یان چاودێری ‹آن شب من در بیمارستان کشیک بودم: ئەو شەوە من لە خەستەخانەدا کێشک بووم›.

**کشیک دادن:** کێشک دان؛ ئێشک دان؛ چاویاری دان؛ کەتوانی کردن.

**کشیک داشتن:** کێشک بوون؛ ئێشک بوون؛ چاوەدێری وەئەستۆ بوون ‹آن شب سارا کشیک داشت: ئەو شەوە سارا کێشک بوو›.

**کشیک کشیدن:** کێشک دان؛ ئێشک دان؛ پاس دان؛ ئاگاداری و چاویاری کردن ‹پشت دیوار کشیک می‌کشید تا همین کە مستأجر آمد، یقەاش را بگیرد: لە پشتی دیوارەکەوە کێشکی دەدا کە هەر کرێنشینەکە هات، یەخەی بگرێ›.

**کعب / ka'b/**: [عربی]/اسم. ڕیشەی سێهەم؛ **کەعب** ‹کعب ۲۷ می‌شود ۳: ڕیشەی سێهەمی ۲۷ دەبێتە ۳›.

**کعبتین / ka'bateyn/**: [عربی] ☜ **کَلبَتِین**

**کف / kaf/**: /اسم. کەف: ۱. /ـ‌ها/ [عربی] سەر؛ تەخت؛ ڕووپەڕی ساف کە لە بانی زەوی یان بەرامبەری میچەوەیە ‹کف اتاق؛ کف خیابان: تەختی دیو؛ سەری شەقام› ۲. [عربی] لەپ؛ لەم؛ شەپ؛ لەواسە؛ بەر؛ چەپ؛ بەشی ڕاست و سافی تاقمێ لە ئەندامان ‹کف دست: لەپی دەست› ۳. کەو؛ کۆمایەک لە تۆقلەی وردیلەی گاز لە تراوێکدا ‹کف صابون: کەفی سابوون› ٤. ماکێ کە وەکوو تۆقلەی چکۆلەی لێهاتووە ‹کف روی آبجو: کەفی سەر ئاوجۆ›.

▣ **کف پا**: لەواسە؛ بەری پێ؛ بەشی ژێرەوەی پا، نێوان پاژنە و قامکانی پا.

**کف دریا**: ۱. بنی زەریا؛ بێخ دەریا ۲. لەپکە؛ قاوغ؛ قالک؛ گوێ ماسیلکە.

**کف دست**: لەپ؛ لەم؛ هەبەک؛ قولمشت؛ قەپال؛ چەپاڵ؛ ماپوک؛ بەری دەست.

**کف صابون**: کەفی سابوون.

▣ **کف به دهان آوردن**: *[کنایی]* کەف چەراندن؛ کەف پڕژاندن؛ ئاگر لە چاو بارین؛ زۆر تووڕە بوون.

**کف دست خود را بو کردن/ نکردن**: *[کنایی]* موو هەڵکزاندن/ هەڵنەکزاندن؛ لە پێشەوە خەبەردار بوون/ نەبوون ‹مگر من کف دستم را بو کرده بودم که تو قرار است امروز بیایی؟: مەگەر من موویان هەڵکزاندبووم کە تۆ بڕیارە ئەمڕۆ بێی؟›.

**کف دست کسی گذاشتن**: نانە ناو لەپی دەستی کەسێکەوە؛ نیانە قولمشت کەسێک: ۱. پێدان(بە سووکایەتیەوە) ‹صد تومان گذاشت کف دستش: سەد تمەنی نایە ناو لەپی دەستی› ۲. بە کەسێک خەبەر دان ‹هر چە را شنیده بود، برد گذاشت کف دست پدرش: هەرچێکی ژنەفتوو بردی نیایە قول مشت باوکی›.

**کف رفتن**: نانە/ نیانە قول مشت و بردن؛ شتێک لە نێو لەپی دەستی خۆدا شاردنەوە و دزین ‹موقع شمردن پولها، یک اسکناس را کف رفت: کاتی بژاردنی پارەکان، ئەسکەناسێکی نایە قول مشتی و بردی›.

**کف زدن**: چەپڵە لێدان؛ چەپ تەقاندن؛ چەپڵەڕێزان.

**کف کردن**: کەف‌کردن؛ تۆقلەی وردیلەی گاز بەدیهاتن ‹چرا نوشابه این‌قدر کف کرده است؟: بۆچی نووشابەکە ئەوندە کەفی کردووە؟›.

**از کف دادن**: *[کنایی، ادبی]* لە دەست دان؛ دەسەنە شیەی؛ لە کیس دان. هەروەها: **از کف رفتن**

**به کف آوردن**: *[کنایی، ادبی]* بە دەست هێنان؛ وە دەس هاوردن؛ دەست خستن؛ دەس وسەی.

**کف آلود / kafālûd/**: *صفت.* کەفاوی؛ کەفی؛ بە کەفەوە (تۆقلەی بچووکی گاز) ‹آب کف‌آلود دریا: ئاوی کەفاوی زەریا›.

**کفائی / kefā'î/**: [عربی] ☜ **کفایی**

**کفار / koffār/**: [عربی] جمعِ ☜ **کافر**

**کفاره / kaffāre** ، ـها/: [عربی]/اسم. کەفارەت؛ کەفارە؛ تۆڵەی تاوان؛ کارێ کە تاوانبار بۆ پا بوونەوە ئەنجامی دەدا (وەکوو سەدەقە دان یان قوربانی کردن).

▣ **کفاره دادن**: کەفارە/ کەفارەت دان؛ دانی پارەیەک بە نەداران بۆ بەخشرانی تاوان.

**کفاره داشتن**: کەفارە/ کەفارەت هەبوون؛ شیاوی تاوانی کەفارەت دان بوون (بۆ کاری نالەبار دەگوترێ).

**کفاش / kaffāš** ، ـها؛ ـان/: [از کفش بە قاعدەی عربی]/اسم. پێڵاودروو؛ پێڵاوکەر؛ کەوشدوور؛ کەوشدروو؛ کەوشدۆز؛ گۆشکار؛ کەسێ کە پێڵاو

دروست دەکا یان دەیفرۆشێ.

**کفاشی** / kaffâšî/: /اسم. گۆشکاری؛ پێڵاودووری؛ کەوشدووری؛ کەوشدۆزی: ١. کار و ڕەوتی قۆندەرەکردن؛ دروونی کەوش ‹مدتی هم کفاشی می‌کرد: ماوەیەکیش پێڵاودووری دەکرد› ٢. /ـها/ کارگە یان دووکانی پێڵاودووری یان کەوشفرۆشی ‹سر همین خیابان کفاشی داشت: لە سەر ئەم شەقامە گوشکاری هەبوو›.

**کفاف** / kafâf, kefâf/: [عربی]/اسم. بەسندەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەس بوون.

▣ **کفاف دادن**: بەش‌کردن؛ بەس بوون؛ وەس کەردەی؛ داخواز بەجێ‌هێنان ‹این پول کفاف خرج یک ماه را هم نمی‌دهد: ئەم پارەیە بۆ خەرجی مانگێکیش بەش ناکا›.

**کفال** / kafâl ، ـها/: [روسی]/اسم. کەفاڵ؛ چەشنێ ماسی خۆراکی کە لە کەرخاو و زەلکاوی سوێردا دەژی، جەستەی درێژ و گەدەی سیکەتۆرەئاسای هەیە: **ماهی کفال**

**کفالت** / kefâlat, kafâlat/: [عربی]/اسم. ١. کار یان ڕەوتی وەئەستۆگرتنی کارێ بە جێی یەکێکی‌تر: *الف)* دەستەبەری؛ مسۆگەری؛ بڕیار لە سەر ئامادەکردنی کەسێک لە شوێنێکدا بۆ کاتێکی دیاریکراو ‹برایش قرار کفالت صادر شد: بڕیاری دەستەبەری بۆ دەرکرا› *ب)* بریکاری؛ وەئەستۆگرتنی ئەرکی کەسێک لە مەزرینگە لە کاتی نەبوونیدا ‹کفالت اداره را به آزاد دادند: بریکاری مەزرینگەیان بە ئازاد دا› ٢. سەرپەرشتی؛ مشوورخۆری؛ خوێداری ‹کفالت بچه‌های برادرش را به عهده گرفت: سەرپەرشتی برازاکانی وە ئەستۆ گرت›.

**کفاندن** / kafândan/: مصدر. متعدی. [قدیمی] ١. قەلاشتن؛ قەلاشدن؛ قلاشتن؛ قەڵشاندن؛ قلیشاندن؛ کەلاشتن؛ تلیشاندن؛ تلیشنەی؛ ترەکنەی؛ دەرزاندن ٢. پاشین؛ پژاندن؛ پژگنەی.

**کفایت** / kefâyat/: [عربی]/اسم. ١. بەسندەیی؛ دۆخی بەس بوون ‹کفایت مذاکرات: بەسندەیی وتوویژ› ٢. وردبینی؛ ڕاوێژ؛ مشوور.

▣ **کفایت کردن**: بەش‌کردن؛ تێراکردن؛ بەس بوون؛ وەس‌کەردەی؛ پێویستی بەجێ‌هێنان ‹برای یک ماه کفایت می‌کند: بۆ مانگێک بەش دەکا›.

**کفایی** / kafâyî/: [عربی] ☜ واجب کفایی، واجب

**کف‌بین** / kafbîn ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. کەفبین؛ قەپاڵ‌گر؛ کەسێ کە گوایە لە ڕووی نەخش و نیگاری لەپی دەستەوە دەتوانێ داهاتووی هەرکەسێک بڵێتەوە و لەمەڕ ژیانیەوە ئاگاداری بدا. هەروەها: **کف‌بینی**

**کفپوش** / kafpûš ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. کەفپۆش؛ پۆشەنێکی ڕازێنەیی یان پاکژیکاری کە زۆرتر لە پێشەوە دروست‌کراوە و بۆ داپۆشینی تەختی شوێنێکی سەرگیراو بە کار دەڕوا ‹اتاق کفپوش چوبی داشت: دیوەکە کەفپۆشی چێوی هەبوو›.

**کفتار** / kaftâr ، ـها؛ ـان/: /اسم. کەمتار؛ کەمتیار؛ کەلەکەمتار؛ قەمتار؛ کەفتار؛ کەڤتار؛ کەفتارۆ؛ کەوتێر؛ گۆڕنەباش؛ گۆڕکەنکە؛ دەستە گیانەوەرێکی گواندار، گۆشتخۆر، شەوگەڕ، سەر زل، ددان سفت و شاویلکە بەهێز و دەست لە حاندی پا درێژترن کە زۆرتر کەلاک دەخۆن.

**کفتر** / kaftar/ ☜ **کبوتر-٢**. هەروەها: **کفترباز؛ کفتربازی**

**کفچلیز** / kafčelîz ، ـها؛ ـان/: /اسم. دەمکەچە؛ کەشکەسەرە؛ کەچکەقوڵە؛ ڕەودەک؛ کەوچکەسەرئاوی؛ چەمچەقوڵە؛ سەرمێکوتە؛ زارۆی ئاوزی هەر یەکە لە دووژینان کە دوای لە هێلکە هەڵجووقان لە سیاوەوە هەناسە دەدەن، پایان نیە و بە بزواندنی کلکیان بەرەو پێش دەڕۆن.

**کفچــه** / kafče ، ـهـا/:اسم. ۱. ☜ **کفگیــر** ۲. کەوچێز؛ کەوچکە چێوینە؛ کەوچکی داریـن ۳. چەمچە؛ کەوچکی گەورە ٤. بەشی کانزایی و پانی پێمەڕە.

**کفچەمار** / kafčemār ، ـها؛ ـان/:اسم. قولـەمار؛ چەشنێ لـە مـارانی خـاکژی و ژەهـراوی (وەک ماری کوبرا) بە کلکی خڕ، گلێنە چاوی هێلکەیی، ڕەنگــی زەردی تــۆخ، قــاوەیی کــاڵ یــان خۆڵەمێشی مەیلـەو ڕەش و مـل وەک کـەوگیر کە دووژینان و پەلەوەرانی بچووک دەخۆن.

**کفخواب** / kafxāb ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/اسم. گونج؛ گۆنج؛ گونجـە؛ گۆنجـە؛ ئـاوەڕۆ؛ لوولـەی کورت بە لێواری پانەوە بۆ دەرچوونی ئاو کە لـە بەر پلووسک یان سەربانانەوە دایدەنێن.

**کفـر** / kofr/: [عربـی]/اسـم. کفـر؛ کـوفر؛ نـاوە: ۱. ناموسڵــمانی ۲. دژبەرایــەتی لەگــەڵ خــودا ۳. زانینی ڕاستەقینە و مل لێ بادانی.

⊡ **کفر کسـی را درآوردن**:[مجـازی] کەسـێ لـە دین دەهری کـردن؛ کەسـێک شـێت‌کـردن؛ کەسێک زۆر تووڕەکردن ‹با حرفهایش کفر همـه را درآورد: بە قسەکانی هەمووی لـە دیـن دەهـری کرد›.

**کفر گفتن**: کفرکـردن/ گـوتن؛ قسـەی دژ بـە دین گوتن ‹چرا کفر می‌گویی؟ تو کار نمی‌کنی خدا چه بکند؟: بۆچی کفر دەکەی؟ تـۆ بـۆ خـۆت کـار ناکەی خودا چی بکا؟›.

**از کفـرابلیس مشـهورتر بـودن**:[مجـازی] زۆر بەناوبانگ بوون (بەتایبەت بە خراپە).

**کفرآمیـز** / kofrāmîz/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. تێکەڵ بە کفر.

**کفــران** / kofrān/: [عربـی]/اسـم. ناسپاسـی؛ بێئەمەگی؛ سپڵەیی؛ پێنەزانی.

⊡ **کفران نعمت کردن**: ناسپاسی‌کـردن؛ کفـری نیعمەت‌کردن ‹نان به این خوبی، چرا کفران نعمت مـی‌کنـی؟: نـان بـەم باشـیە، بـۆچی ناسپاسـی دەکەی؟›.

**کفرستیز** / kofrsetîz ، ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. دژ بە کفر؛ بە خوو و هۆگرەتی شەڕکردن لەگەڵ کفردا.

**کفــرو** / kafrow ، ـان/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. [جانورشناسی] بە تایبەتمەنـدی ڕێگـە ڕۆیـین لـە سەر تەواوی بەری پێوە (وەک ورچ).

**کفری** / kofrî/: [عربی] صفت.[گفتـاری] قـرم‌پـڕ؛ کفری؛ زیز؛ زۆر تووڕە.

⊡ **کفری شدن**:[گفتاری] کفـری بـوون؛ قـرم‌پـڕ بوون؛ زۆر تووڕە.

**کــفـزن** / kafzan ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/اسم. گیرفان‌بڕ؛ دزێ کە شتێک، بەتایبـەت پـارە، بـە فرزی لە گیرفانی خەڵک دەردێنـێ و لـە لـەپی دەستیدا دەیشارێتەوە و دەیبا.

**کفزنی** / kafzanî ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/اسم. گیرفــانبــڕی؛ دەرهێنــانی پــارە و شــتی بایەخداری‌تر لە گیرفانی خەڵکی و شـاردنەوەی لە لەپی دەستدا.

**کفسـابی** / kafsābî ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/اسم. کەفسـاوی؛ کـار و ڕەوتی سـاوینەوەی تـەختی جێگایەک (وەکـوو مـاڵ) بـۆ خـاوێن‌کردنـەوە و بریقە لێخستن. هەروەها: **کفساب**

**کفساز** / kafsāz ، ـهـا/:اسم. کەفسـاز؛ کەفکـەر؛ هەر یەکە لەو ماکە کیمیاییانە کە کەف دروست دەکەن.

**کفسازی** / kafsāzî/:اسم. کەفسازی: ۱. [عربی/ فارسی] کاری دروست‌کردنی تەختایی بینایـەک ‹کفسـازی اتاقها تـازه شـروع شـده است: کەفسـازی دیوەکان تازە دەستی پێکـردووە› ۲. کـار و ڕەوتی دروست‌کردنی کەف، بەتایبەت بۆ کوژاندنـەوەی ئاگر.

**کفش** / kafš ، ـها/:اسم. پێڵاو؛ پێلاف؛ پێڵا؛ پـاڵا؛ پاڵاو؛ پێڵـە (ژنانە)؛ شـەکاڵ؛ کـەوش؛ کـەفش؛ سۆڵ؛ سۆڵک؛ تسەک؛ قۆنگرە؛ قۆندرە؛ قۆنـدەرە؛

چەمیش؛ تایاخ؛ مووزک؛ پۆشەنی دەرەکی پای مرۆڤ، زۆرتر لە چەرم یان ماکێکی نەرم، بە ژێرە و سەرەوە.

▣ **کفش اسکی**: کاشکان؛ کاشیکان؛ پێڵاوی خلیسکێن.

**کفش بچه‌گانه**: پاپووچە؛ پاپەجانە؛ پاپاجانە؛ پێ بە جانی؛ پێچلە؛ شمشمک؛ تەق‌تەقیلە.

**کفش برقی**: کەوشی بریقەدار؛ پێڵاوێ کە سەرەکەی ساف و بریقەدارە: **کفش ورنی**

**کفش پاشنه‌دار**: کەوشی پاژنەدار؛ قۆندرە؛ قۆندەرە؛ کەوشێکی تەخت کە پاژنەکەی بەرزە. بەرانبەر: **کفش تخت**

**کفش تخت**: کەوشی تەخت؛ پێڵاوێ کە پاژنەی جیای نیە و تەختی زەویە. بەرانبەر: **کفش پاشنه‌دار**

**کفش تنگ و پای لنگ**: *[کنایی]* نانی کەم و میوانی زۆر؛ دەستی بەتاڵ و زگی بەتاو؛ دۆخی نەبوونی هیچ پێداویستیەک.

**کفش غواصی**: پافین؛ کەوشی مەلەوانی؛ پێلاوی لاستیکی پارووئاسا بۆ خێرا مەلە کردن.

**کفش کتانی**: کەوشی کەتانی؛ پێڵاوێ کە ڕووەکەی لە پارچەیەکی پتەوە.

**کفش ماشینی**: کەوشی ماشینی؛ پێلاوێ کە بە ماشین دووراوە.

**کفش ورنی** ☜ **کفش برقی**

▣ **کفش پاره کردن**: *[کنایی]* کاڵە دڕان و هیچ پێ بەبڕان؛ ڕاکردنی بێهۆ.

**کفش کسی را پیش پایش جفت کردن**: *[کنایی]* دەست نانە پشت چاوی کەسێکدا؛ دەستێکی تەڕ هێنانە قنگی کەسێکدا؛ خوێ/ ئاو کردنە کەوشی کەسێک؛ کەسێک وەدەرنان ‹کفش او را پیش پایش جفت کن و **بگو خوش آمدی**: دەست بنێ پشت چاویدا و بڵێ بە خێر چی›.

**کفش و کلاه کردن** ☜ شال و کلاه کردن، شال

**پا توی کفش کسی کردن** ☜ **پا**[1]

**ریگی به کفش داشتن** ☜ **ریگ**

**هر دو پا را در یک کفش کردن** ☜ **هر**

**کفشدار** / kafšdār ، ـها/:اسم. کەوشدار؛ کەسێ کە لە مزگەوت و زیارتگەکاندا ئاگای لە پێڵاوی خەڵکە. هەروەها: **کفشداری**

**کفشدوز** / kafšdûz ، ـها/:اسم. ۱. /ـان/ کەوشدروو؛ کەوشدوور؛ کەوشدۆز؛ پالاوراز؛ پێڵاودروو؛ پێڵاودوور؛ سۆلکەر؛ سۆلدروو ۲. ☜ **کفشدوزک**

**کفشدوزک**/ kafšdûzak ، ـها/:اسم. خاڵخاڵۆکە؛ خالخالۆکە؛ خالخالۆک؛ خالخالک؛ مامەلە؛ مامەلێ؛ مامالە؛ سپل؛ ماڵماڵەسوورە؛ مامالەسووری؛ ماڵخالوو؛ مالهالوو؛ فاتەڕەشە؛ شەمامە؛ گوێرەکەسوورە؛ جۆری مێرووی ژێر زگ و پا ڕەشی قاپ سوورە کە خاڵی ڕەشی تێدایە: **کفشدوز ـ۲**

**کفشک** / kafšak ، ـها/:اسم. کەفشەک؛ نیوجەغزێک کە لێنتی تورموزی لە سەر پەرچ دەکەن.

**کفشک ماهی**/ kafšakmāhî/ ☜ ماهی پهن، **ماهی**[1]

**کفشکن** / kafškan ، ـها/:اسم. کەوشکەن؛ پێشخانە؛ مالماشت؛ پاکەنە؛ پالاوەژ؛ پالاوەش؛ جێگەی کەوش داکەندن لە پەنای درگاوە.

**کفشور** / kafšûr ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. گونج؛ لوولەیەکی چکۆلە بە لێواری پان و هەڵگەڕاوەوە کە لە سەر لوولەی ئاوڕۆوە دایدەنێن.

**کفک** / kafak/ ☜ **کپک**

**کفگیر** / kafgîr ، ـها/:اسم. مەفسک؛ مفسک؛ هسکیف؛ مووخل؛ ئەستێڤک؛ کەوگیر؛ قەواش؛ کەفگیر؛ مووچ؛ ئامێرێ کە ناوەکەی تۆزێ قووڵە، بە دەستەیەکی درێژەوە کە بنی چێشت یان خواردەمەنی بێئاوی پێ هەڵدەگرن:

**کفچه_۱**

▣ **کفگیر به ته دیگ خوردن:** *[کنایی]* کەوتنە پیسی؛ بێ‌پووڵ و نەدار داکەوتن ‹وقتی کفگیر به ته دیگ خورد، مجبور شدم بروم کار کنم: کاتێ کەوتمە پیسی، ناچار بووم بچم کار بکەم›.

**کفگیرک** / kafgîrak/: *اسم. [پزشکی]* هانەکوانە؛ جۆرێ نەخۆشی پێستی کە چەند پیازی موو و دەور و بەری دا دەگرێ و لە چەند کونیەوە چڵک دێتە دەرەوە.

**کفل** / kafal ، ـها/: [عربی]/*اسم.* کەماخ؛ کاماخ؛ کامۆخ؛ کلۆت؛ کلۆمت؛ کەڵۆت؛ کوروێت؛ تەرماڵ؛ نێهک؛ نێک؛ تەراف؛ کەفەڵ؛ کەفەل؛ هێفەل؛ سوورین؛ پاشڵ؛ قاڵچە؛ سمت؛ سمتە؛ سمتۆڵ؛ لاران؛ زۆپی ژێر ناوقەد و ژووری ران: **کَپَل**

**کفلمه** / kaflame/: [عربی/ ترکی]/*اسم.* هاردەقووت؛ کەفلەمە؛ کاری رژاندنی شتێکی ورد (وەک قاووت و ئاردەتوو) لە سەر لەپی دەست و هەڵمژینی بۆ ناو زار. هەروەها: **کفلمه کردن**

**کف‌مال** / kafmāl/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* لەپساو؛ کەفماڵ؛ کاری بە دەست ساوین و ورد کردنی شتێک (وەکوو سەوزی وشک) لە لەپی دەستدا. هەروەها: **کف‌مال کردن**

**کفن** / kafan ، ـها/: [عربی]/*اسم.* کفن؛ کەفەن؛ کەپەن؛ جامەمەرگ؛ قەرقە؛ قەرقەل؛ خەلات؛ خلات؛ جیاز؛ بەرگی مردوو؛ پارچەیەک (زۆرتر جاوە) کە مردووی تێدا دەپێچنەوە و لە قەبری دەنێن.

▣ **کفن پوشیدن:** کفن پۆشین؛ ئامادەی مەرگ بوون.

**کفن کردن:** کفن/ کەفەن‌کردن؛ کەفەناندن؛ بەرگی مەرگ لە بەر مردوو کردن.

**از بی‌کفنی زنده بودن:** *[کنایی]* لە بێ‌قەوری نەمردن؛ زۆر هەژار و نەدار بوون ‹مرا که می‌بینی از بی‌کفنی زنده‌ام: وا دەمبینی لە بێ‌قەوری نامرم›.

**کفن‌دزد** / kafandozd ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کفن‌دز: ۱. دزێ کە قەبر دەداتەوە بۆ کفن دزین ۲. *[کنایی]* کەوش‌دز؛ مرۆی زۆر گۆسارتمە و بێ‌چاو و ڕوو ‹در مورد رییس تازه باید گفت، صد رحمت به کفن‌دزد اولی: لەمەڕ سەرۆکی تازەوە دەبێ بێژین، هەم شوکر بە کفن‌دزی پێشوو›.

**کفن‌ودفن** / kafn-o-dafn ، ـها/: [عربی]/*اسم.* کەفن و دەفن؛ کفن و دفن؛ کار و ڕەوتی کەفەناندن؛ کفن لەبەر کردن و لە قەبر نانی تەرم.

**کف‌نفس** / kaffenafs/: [عربی]/*اسم. [قدیمی]* خۆڕاگری؛ ڕەوتی بەرخۆگرتن و تووشی هەڵە یان گوناه نەبوون.

**کفه** / kafe ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ناوە؛ تا؛ ئەوەی کە لە تەختانی ناو دەست دەکا.

▣ **کفه‌ی ترازو:** تای تەرازوو؛ تا ترازوو؛ ڕووپەر یان دەفرێک لە تەرازوودا کە سەنگ یان کاڵای لەسەر دەنێن.

**کفه‌ی جنس:** تای کاڵا؛ ئەو پەلەی تەرازوو کە شتی تێ دەنێن.

**کفه‌ی سنگ:** تای سەنگ و بەرد؛ ئەو پەلەی تەرازوو کە سەنگی لەسەر دەنێن.

**کفی** / kafî ، ـها/: [عربی]/*اسم.* کەفی؛ بەشی بارهەڵگری ترەیلی کە بە هۆدەی پشتی ئاژۆوانەوە دەبەسترێ.

**کفیر** / kafîr/: [؟] ☜ **کومیس**

**کفیل** / kafîl ، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم.* دەستەبەر؛ کەسێ کە سەرپەرشتی کەس، شت یان شوێنێکی وەئەستۆیە ‹کفیل استانداری کرکوک: دەستەبەری پارێزگای کەرکووک›.

**کک** / kak ، ـها/: *اسم.* کێچ؛ چێچ؛ قێچ؛ کەیک؛ کەک؛ کەکی؛ کەکەیی؛ میرووەکی چکۆلەی خۆشبەزە، پێگەیشتووەکەی لە خوێنی

پەلەوەران و مۆرغەداران دەژی: **کِیک ـ٢**

▣ **کک بە تنبان کسی افتادن:** *[کنایی]* کێچ کەوتنە کەوڵ/ شواڵی کەسێک؛ کرمی سەری کەسێک جووڵان: ١. خراپ تووشی ڕاڕایی بوون ‹چند روز است کک به تنبانش افتاده که برود موبایل بخرد: چەن ڕۆژە کێچ کەوتۆتە کەولی بڕوا موبایل بکڕێ› ٢. پیس شڵەژان؛ تووشی دڵەخورپێ و ترسی زۆر بوون.

**کک کسی (را) نگزیدن:** *[کنایی]* مووی کەسێک نەلەرینەوە؛ مێشیش بە لای کەسێکەوە میوان نەبوون؛ نە با پێدا هاتن نە بۆران؛ نەکەوتنە ژێر کارتێکەری شتێکەوە ‹وقتی خبر جنگ را شنید ککش هم نگزید: کاتێ هەواڵی شەڕی بیست هەر مووشی نەلەریەوە›.

**کک** / kok/: [انگلیسی] *اسم.* کوک؛ چەشنێ بەردەخەڵووزە زۆرتر بە شێوەی دەسکرد دروست دەبێ.

**کک‌کوچ** / kak.kûč، ـها/: *اسم.* ڕەشادۆک؛ تووزەفەرەنگی؛ دیژنک؛ تەشنەک؛ گیایەکی یەکساڵەیە لە تاقمی تەڕەتیزە.

▣ **کک‌کوچ خوراکی:** ڕشادۆکە فەرەنگی؛ جۆرێک تەڕەتیزەیە لە تۆمەکەی ڕۆن دەگرن.

**کک‌مک** / kakmak، ـها/: *اسم.* نمووس؛ پەڵەی سەر ڕوخسار؛ وردەخاڵی قاوەیی سەر پێستی لەش بەتایبەت ڕوومەت، کە لە بەر هەتاوەوە زۆرتر دیاری دەدا.

**کک‌مکی** / kakmakî، ـها/: *اسم.* نمووسی؛ نمووساوی؛ بە نمووسەوە.

**کل**[1] / kal، ـها/: [کردی] *اسم.* کەڵ؛ کەل؛ کەڵەکێوی؛ کەڵەکێفی؛ حەچەکێوی؛ حەچەکێفی؛ نێریەکێوی؛ بزنی کێوی نێر کە لە شاخاندا دەژی.

**کل**[2]: *صفت. [گفتاری]* کەچەڵ؛ کەچەر؛ گڕ؛ گەڕ؛ گەڕۆڵ.

**کل** / kel/: *اسم.* لوو؛ کلوو؛ دەنگێکی تایبەتی وەک قیژە، کە لە جێژن و زەماوەندا ژنان بۆ خۆشی بە دەست و زاریان دەریدێنن. هەروەها: **کل کشیدن**

**کل** / kol/: [از کردی] *صفت. [گفتاری]* ١. کوڵ؛ کەلی؛ کورتەوە بوو بە هۆی شکان یان بڕانەوە ‹دُم‌کل: کلک‌کۆل› ٢. کول؛ نەتیژ. بەرانبەر: **تیز** ‹چاقوی کل: چەقۆی کول›.

**کل** / kol(l)/: [عربی] *صفت.* ١. هەموو؛ گشت؛ تەواو؛ تواو؛ تەڤ؛ گ؛ گرد؛ تێکڕا؛ گردین؛ هەمە ‹کل عالم از این ماجرا باخبرند: هەموو خەڵک لەم ڕووداوە ئاگاداران› ٢. گشتی؛ هەموانی؛ بە تایبەتمەندی لە ژێر پەلدا بوونی تەواوی ئەندامان ‹ادارەی کل: بەڕێوەبەرایەتی گشتی›.

**کلا** / kolā/: [؟] ☜ **کولا**

**کلاً** / kollan/: [عربی] *قید.* یەکسەر؛ تێکڕا؛ سەرهەم؛ سەرجەم: ١. تەواو؛ تواو؛ تەواوەتی؛ پاک؛ ساف ‹کلاً همه را بنداز دور: یەکسەر هەمووی فڕێ بدە› ٢. پێکەوە؛ گردەوە؛ سەریەک؛ یۆوە؛ یەکەژە؛ بە گشتی ‹کلاً می‌شود گفت کار خوبی نیست: سەرجەم دەتوانین بێژین کارێکی باش نیە›.

**کلاپیسە** / kalāpîse/: *اسم.* چاوحەوایی؛ چاوحەواوی؛ دۆخی چاو هەڵگەڕانەوە؛ چاو سپی بوونەوە؛ خزانی گلێنەی چاو و ون بوونی لە پشت سپێنەی چاودا.

**کلاته** / kalāte، ـها/: *اسم.* ١. پاچەقوڵێ؛ پێ لە پێ پێچان لە زۆرەبانیدا ٢. *[قدیمی]* کەلاوەکۆن؛ کاولەکۆن؛ کاولاش؛ کەلاوە؛ ماڵی زۆر بچووک و لە دەم ڕووخان ٣. *[قدیمی]* کەلا؛ قەلا؛ کەلەهـ؛ کەلات؛ قەلات؛ ماڵی شا لە نیوەڕاستی شاردا.

**کلاج** / kelāc/: [انگلیسی] ☜ **کلاچ**

**کلاچ** / k(e)lāč، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* کەلاچ؛ ئامێری گەیاندن و بەردانی هێزی موتور بۆ گیربوکس: **کلاچ**

**کلارینت** / k(e)lārînet، ـها/: [فرانسوی] *اسم.*

قەرەنەی؛ کلارینێت.

**کلاژ** / kolāj/: [فرانسوی]/سم. کولاژ: ۱. کار و هونەری چەسپاندنی لەتەکاغەزی ڕەنگی، پارچە، چێو و... بۆ دروستکردنی وێنەیەک ۲. /ـها/ وێنەیەک کە بەم شێوە دروستکراوە ☜ **کۆلاژ**

**کلاژن** / kollājen/: [فرانسوی]/سم. سریش؛ سریش؛ ستووک؛ ماکێکی چەسپنە لە ئێسکدا کە بە کولاندنی زۆری ئێسک لە ئاودا، لیی دەبێتەوە و دەبێتە چەسپێکی سروشتی: **کولاژن**

**کلاس** / kelās، ـها/: [فرانسوی]/سم. کلاس؛ کەلاس؛ کلاس: ۱. وانگە؛ دیوی خوێندن لە خوێندنگا ‹کلاس درس: وانگەی خوێندن› ۲. پۆل؛ قۆناغێکی دیاریکراو لە خوێندن ‹دانش‌آموز کلاس پنجم: خوێندەواری پۆلی پێنجەم› ۳. زانین یان هونەری دیاریکراو کە لە جێگایێ دەرس دەدرێ ‹کلاس شنا: کلاسی مەلە› ٤. دانیشتنی وانە ‹امروز در کلاس استاد شرکت کردم: ئەورۆ لە کلاسی مامۆستا بەشدار بووم› ٥. [زیست‌شناسی] لە یەکەگەلی ڕزنکردنی گیانەوەران و گیاگەل، بریتی لە چەند ڕاستە، کە خۆی بەشێکە لە لقێک ٦. پلە؛ جێگا؛ پایە.

◘ **کلاس آمادگی**: پێش سەرەتایی؛ کلاسێکی تایبەتی بۆ تەیارکردن و ڕێخستنی قوتابی، بەتایبەت بۆ منداڵانێ کە تازە دەچنە قوتابخانەوە.

**کلاس بالا** / kelāsbālā/: [فرانسوی/ فارسی] ☜ **باکلاس**

**کلاس پایین** / kelāspāyîn/: [فرانسوی/ فارسی] ☜ **بی‌کلاس**

**کلاسداری** / kelāsdārî/: [فرانسوی/ فارسی]/سم. کلاسداری؛ کار و ڕەوتی بەڕێوە بردنی کلاسی دەرس ‹در یک دورەی کلاسداری شرکت کردە بود: لە خولێکی کلاسداریدا بەشداری کردبوو›.

**کلاسور** / k(e)lāsor، ـها/: [فرانسوی]/سم. کلاسور؛ بەرگێ کە دوو یان چوار فەنەری تێدا بە کار هێنراوە بۆ دەستە ـ دەستەکردنی کاغەز یان مقەبا.

**کلاسه** / k(e)lāse/: [فرانسوی]/سم. ڕزن؛ ڕیز؛ ڕەج؛ سەف؛ پێڕە.

◘ کلاسه شدن: ڕزن — ڕزن بوون؛ ڕیز بوون؛ چین‌بەندی بوون.

**کلاسه‌بندی** / k(e)lāsebandî، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/سم. ڕیزبەندی؛ ڕیزگری؛ پۆل‌بەندی؛ دەستەبژێری؛ پۆلێن؛ کار و ڕەوتی ڕیزکردنی شتان بە پێی تایبەتمەندیان.

**کلاسی** / kelāsî/: [فرانسوی] صفت. وانگەیی؛ پۆلی؛ کلاسی؛ سەرکلاسی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کلاسەوە ‹تکلیف‌های کلاسی: مەشقی کلاسی›.

**کلاسیسیسم** / k(e)lāsîsîsm/: [فرانسوی]/سم. کلاسیسیسم: ۱. شوێنگری لە شێوازی هونەر، شیعر یان نووسینی کۆن ۲. بنەما و دیاردەکانی وێژە و هونەری یۆنان و ڕۆمی کۆن.

**کلاسیک** / k(e)lāsîk، ـها/: [فرانسوی] صفت. کلاسیک: ۱. کۆن؛ گرێخواردوو بە کاتی گەشەی هونەر و وێژە لە ڕابردوودا ‹عصر کلاسیک در تاریخ اروپا به دورەی امپراتوریهای یونان و روم گفته می‌شود: سەردەمی کلاسیک لە مێژووی ئوروووپادا بە دەورانی دەسەڵاتداری یۆنان و ڕۆم دەگوترێ› ۲. وانەیی؛ پێوەندیدار بە وانەی فێرگەییەوە ‹معلومات کلاسیک: ئاگاداری کلاسیک›.

**کلاش** / kallāš، ـها/: صفت. دەسبڕ؛ شەڵلات؛ خاپان؛ قەڵاش؛ داوباز؛ خاوەن هۆگرەتی و خۆی دەست برین.

**کلاشی** / kallāšî، ـها/:/سم. داوبازی؛ دەسبڕی؛ شەڵلاتی؛ خاپانی؛ قەڵاشی؛ کاری ساندنی شتێک لە دیتران بە گزی و فزی.

**کلاغ** / kalāq، ـها؛ ـان/:/سم. قەل؛ قالاو؛ قاڵاو؛ قڕاک؛ قرک؛ قژاک؛ قلاق؛ قلا؛ قەلاو؛ قلاچە؛

قلاژیله؛ قڕ؛ قژاک؛ قژیاک؛ قوویاک؛ قارقارۆک؛ قارپچۆک؛ قیژک؛ قراڕک؛ چیق؛ کژیک؛ قەرپلاش؛ قەلاسیلکە؛ تیرەیەک باڵندەی ڕەش، ڕەش و سپی یان بۆرە بە باڵ و پێ و دەندووکی ئەستوور و بەقەوەتەوە کە هەموو شت خۆر و بەکۆمەڵ ژین و مێ و نێریشیان وەک یەکە.

▣ **کلاغ ابلق** ☜ **کلاغ معمولی**

**کلاغ زاغی**: قەلاسیلکە؛ قشقەڕە؛ قشقاڕ؛ قژگ؛ قژگە؛ قشقەڵە؛ قەلە؛ چکە؛ قەرەباچکە؛ قەلەبازەڵە؛ کەلەباشن؛ خۆمەژێرە؛ قاژوو؛ قاژک؛ جۆرێ قالاوی نووک و کلک درێژ، پەڕ و دووچکە ڕەش، سەوز یان ئەرخەوانی کە تایبەتی دەشت و سارایە.

**کلاغ سیاه**: قەلەڕەش؛ قەلەڕەشە؛ قالاوەڕەشە؛ قەلەڕەشکە؛ کەلەڕەش؛ سیاوقەلاو؛ قەلاوە سیاوە؛ قرک؛ قراک؛ کۆربەلا؛ قالاخ؛ گەورەترین باڵندە لە ناو تیرەی قالاواندایە کە هەموو شتێک دەخوا، هەموو گیانی ڕەشە و پەڕەکانی بریقەدارن و سێبەرێ وەک کۆلکەزێرینە دەخەن، فڕینی ڕاست و بە قەوەتە، یەکجار تەمەن درێژە و جووت‌ـجووت دەژین و هێلانەی گەورە دروست دەکەن: **غراب**

**کلاغ معمولی**: بۆرەپنە؛ قالاوە بوولینە؛ قەلەسابوونی؛ قەلەسابوونە؛ جۆرێ قەل بە ڕەنگی ڕەش و خۆڵەمێشی کە زۆرتر لەگەڵ قالاوانی‌تر هەڵدەفڕێ: **کلاغ ابلق**

▣ **یک کلاغ چهل کلاغ کردن** ☜ **یک**[2]

**کلاغ‌پر** / kalāqpar/: *اسم*. ۱. ☜ **گنجشک‌پر** ۲. *[بنایی]* چەشنێ ئاجورچنی کە لێواری ئاجورەکان وەک قونگەرە دەردێ ۳. *[بنایی]* تێغەیەک لە ئاجۆر کە وەکوو بەرگرێک لە سەر دیواری سەرەکی دروست دەبێ ٤. *[بنایی]* ئاجۆرێ کە لایەکیان خوار شکاندووە ٥. قەلباز؛ قەلفڕ؛ چەشنێ پەڕین کە قنیچکە دەکەن و دەست لە پشتی مل دەنێن و بەرەو پێش هەڵدەبەزن ٦. *[گفتاری]* سەلای سوح؛ مەلابانگدان؛ کازیوەی بەیانی؛ دەمەوبەیانی ۷. *[گفتاری]* ئەنگۆرە؛ هەنگۆرە؛ ئەنگۆری؛ هەنگڤار؛ درەنگان؛ تەنگی ئێوارە؛ نزیک خۆراوا؛ زەردەی خۆراوا؛ یەرەووتەنگ؛ وێرەگا؛ وەرەگا؛ تاریکان؛ تاریکەی؛ ڕۆژپەڕ؛ ئێوارەی درەنگ.

**کلاغچه** / kalāqče/: *اسم*. کلاغ زاغی ☜ **کلاغ**

**کلاغک** / kalāqak، ـها/: *اسم*. عەمرۆکە؛ عەمرووکە؛ قالاوخوەرک؛ قالاوخوەرە؛ گورالە مووسایی؛ گیایەکی پایای لە تیرەی سوێسنەیە بە گوڵی شەش ددانەی سپی یان بنەوشەوە.

**کلاغی** / kalāqî، ـها/: *اسم*. هەوری؛ پارچەیەکی ئاوریشمی ناسکە بۆ سەرپێچ و ڕووبەندی ژنان بە کار دێ.

**کلاف** / kalāf، ـها/: *اسم*. ۱. پار؛ کلاف؛ کلافە؛ کەلاف؛ کەلافە؛ کلف؛ بەن یان شریتی لە دەوری جەغزێک پێچراو و لە ناوقەدەوە بەسراو ۲. گلۆلە؛ گولۆلە؛ گولۆلک؛ گولۆک؛ گرۆف؛ کەلو؛ قاتمە؛ قاroot؛ کۆمایەکی تۆپەڵپێچراو لە بەن، شریت یان شتی‌تر ۳. کلاف؛ شریت یان سیرمێک (لە چێو یان کانزا) کە بۆ بەستنەوە و شەتەکدانی بەستەیەک بە کار دەبرێ ٤. ☜ **کارگاه ـ۳**

▣ **کلاف سردرگم**: ۱. تەزبێح کوێر؛ ڕشتەیەکی وا ئاڵۆز کە بە سانایی نەکرێتەوە ۲. *[کنایی]* گیر و گرفتێک کە ڕێگای چارەسەر کردنی بۆ نەدۆزرابێتەوە.

**کلافرنگی** / kolāfarangî، ـها/: [فارسی/ از فرانسوی] *اسم*. کلاوفەرەنگی؛ ژوورێکی گرد (شەش‌سووچ یان هەشت‌سووچ) کە دەوراندەوری دەرگا و دەلاقەیە و بە دەوری میچەکەیدا سابات کراوە: **کلاه‌فرنگی**

**کلافگی** / kalāfegî/: *اسم*. *[مجازی، گفتاری]* ئاڵۆزی؛ وەڕەزی؛ وەڕسی؛ وەڕەسی؛ بێ‌تاقەتی؛

دۆخ یان چۆنیەتی جاڕز و تووڕە بوون.

**کلافه**[1] / kalāfe ، ـها:/اسم. [گیاەشناسی] ریشاڵە؛ تالگەلی دریژ و بەن‌ئاسای لاسکی کارگ.

**کلافه**[2]: صفت. گلۆلە؛ گرۆلە؛ تێکهاڵاو؛ تێکەوەپێچراو ۲. [گفتاری] وەڕەز؛ وەڕس؛ جاڕز؛ بێ‌ئۆقرە و هەدا بە هۆی ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ دۆخێکی ئازاردەرەوە (وەکوو ئێش، هەرا و هوریا، گەرما) ‹صدای دزدگیر همه را کلافه کرده بود: دەنگی دزگیرەکە هەمووی وەڕەز کردبوو›. هەروەها:

**کلافه بودن؛ کلافه شدن؛ کلافه کردن**

**کلاکموش** / kalākmûš ، ـها؛ ـان/:اسم. دووپایلە؛ دوپایلکە؛ دووپا؛ مشک کەروێشک؛ گیانەوەری گوانداری جوێنەر، لە چەشنی مشک کە پای لە دەستی زۆر زلتر و دریژترە و هەڵدەبەزێ:

**کَلاهو؛ یَربوع**

**کلاله** / kolāle ، ـها:/اسم. ۱. پۆپە؛ پۆپکە؛ کاکۆڵ ۲. تەوقەتە؛ تەوقە؛ گەوە؛ بازنەیەکی نەواری لە زێڕ و زیو یان گوڵ و پەڕ و پۆ و... کە لە هەندێک جێژناندا بۆ پیرۆزبایی دەینێنە سەر کەسێکەوە ۳. [گیاەشناسی] کلاوە؛ کولاوە؛ کولیلک؛ تانجیک؛ بەشێک لە مێوینەی گوڵ کە گەردەی لە سەر دەنیشێ.

**کلام** / kalām ، ـها:/ [عربی] اسم. ۱. وتە؛ واتە؛ قسە؛ قسیە؛ قسێ؛ گوتە؛ لەغوم ‹کلام آخر و ختم کلام را بگویم: وتەی دوایی و دوایین واتە بێژم› ۲. کەلام؛ زانیاری تایبەت بۆ سەلماندنی ڕاست و ڕەوا بوونی دین بە یارمەتی زۆرێک بەڵگەی ئاوەزپەسند و دەرخستنی هۆی سەرکی بەدیهاتن و گۆڕانکاری جەهان.

◻ **کلام بلیغ**: وتەی پاراو؛ قسەی جوان و ڕوون.

**کلامی** / kalāmî/: [عربی] صفت. ۱. وتەیی؛ قسەیی؛ واتەیی؛ گوتەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە قسە و پەیڤەوە ‹ارتباط کلامی: پێوەندی وتەیی› ۲. کەلامی؛ سەر بە زانیاری کەلام.

**کلان** / kalān/: صفت. [ادبی] مەزن؛ مازان؛ مازن؛ گەورە؛ گاورە: ۱. بەربلاو. بەرانبەر: **خُرد** ‹اقتصاد کلان: ئابووری مەزن› ۲. زۆر؛ فرە؛ فریە؛ بە چەندیەتی زۆرەوە ‹پول کلان: پارەی زۆر›.

**کلانتر** / kalāntar ، ـها؛ ـان/:اسم. کەلانتەر: ۱. سەرۆکی کەلانتەری ۲. سەرۆکهۆز؛ سەرەکهۆز؛ گەورەی هۆزێ کە لە بناری کێو و چیادا دەژین ۳. [قدیمی] کوێخا؛ قێخا؛ کەیخودای گەڕەک ٤. بەرپرسی بەڕێوەبەری قانوون لە شار یان پارێزگایەکدا (لە ئەمریکا).

**کلانتری** / kalāntarî ، ـها:/اسم. کەلانتەری: ۱. مەزرینگەیەک کە بەرپرسی بەڕێوەبردنی قانوون لە شار یان بەشێک لە شارە ۲. ساختومانی ئەو مەزرینگەیە ۳. پیشەی کەلانتەر.

**کلانخوار** / kalānxār/ ☜ **دُرُشتخوار**

**کلانسال** / kalānsāl ، ـها؛ ـان/: صفت. کالە؛ کاڵ؛ کامڵ؛ گەورەساڵ، بەتایبەت بە تەمەنی زۆرتر لە ٤٠ ساڵ.

**کلانسالی** / kalānsālî/:اسم. کالەیی؛ کالی؛ دۆخ یان چۆنیەتی گەورەساڵ بوون.

**کلانشهر** / kalānšahr ، ـها:/اسم. شارمازن؛ گەورەشار؛ کەڵەشار؛ شاری پڕئاپۆرە کە چەن شاری گرتۆتە بەر.

**کلاوسن** / k(e)lāvsan ، ـها:/ [فرانسوی] اسم. کلاوسین؛ سازی ژێداری بشکوژدار کە لە پیانۆ دەچێ.

**کلاه** / kolāh ، ـها:/اسم. ۱. کلاو؛ کولەهـ ؛ کولاو؛ کولاوە؛ کۆلار؛ کووتۆز؛ کولاف؛ کولۆز؛ کور؛ کووم؛ کوم؛ کوومک؛ پۆشەنێ کە دەکرێتە سەر و زۆرتریش لێوار و دەورەی هەیە ۲. [گیاەشناسی] کلاوە؛ سەری کارگ؛ کلاوەی قارچک.

◻ **کلاه آهنی** ☜ **کلاهخود**

**کلاه ایمنی** ☜ **کاسک**

**کلاه بره**: کلاوی پارچەیی بێ‌لیو و تەخت.

**کلاه بوقی**: کلاوبۆقی؛ کلاوی وەکوو

کەلەقەند.

**کلاه بی‌لبه:** کوومزڕ؛ کلاوی بێ‌لێوارە.

**کلاه پهلوی:** کلاوی پالەوی؛ کلاوپالەوی؛ کلاوێکی گرۆڤەر کە لە سالانی ۱۳۰۶-۱۳۱٤ی هەتاوی لە ئێران کلاوی فەرمی پیاوان بوو.

**کلاه حصیری:** کلاوقۆڕی؛ کلاوقووری؛ کلاوی لە پووش چێ‌کراوی لێوارەدار بۆ بەرگری لە تیشکی خۆر.

**کلاه زرین:** کلاوزەڕ؛ کلاوئالتوون؛ کلاوزێڕ؛ کلاوزێڕین؛ تەپلەزێڕین؛ خشلێکی ژنانە بە شێوەی کلاوێ کە لە سکە زێڕی پێکەوە لکاو دروست بووە.

**کلاه شب:** شەوکلاو؛ کلاوقووچ؛ مینا؛ فینا؛ کمک؛ کوومک: **کلاه شبانه**

**کلاه لبه‌دار:** شەبقە؛ شەبکە؛ شەپقە؛ شەپکە؛ کلاوپاساری.

**کلاه شرعی/ قانونی:** *[مجازی]* کلاو شەرعی؛ ڕێچاری بە ڕواڵەت بەرامبەر بە شەرع و ئایین.

**کلاه نمدی** ☜ **کلاه‌نمدی**

▣ **کلاه برای سر کسی گشاد بودن:** *[کنایی]* پارووی دەمی کەسێک نەبوون؛ گیای کەسێک نەبوون؛ زۆرتر لە ڕادە و شیاوی کەسێک بوون ‹**من نمی‌توانم، این** کلاه برای سرم گشاد است: **من ناتوانم، ئەمە** پارووی دەمی من نیە›.

**کلاه خود را بالاتر گذاشتن:** *[تعریض]* قیت ڕاوەستان؛ هەست بە سەربەرزی کردن و لە ڕاستیدا جێ شەرمەزاری بوون.

**کلاه خود را بر زمین زدن:** *[کنایی]* جامانە کوتانە زەویدا؛ تووڕەیی خۆ نیشان دان.

**کلاه خود را به هوا انداختن:** *[کنایی]* سەما بۆکردن؛ کلاو خستنە ئاسمانا؛ زۆر خۆشحاڵ بوون ‹**البته که قبول می‌کند،** کلاهش را هم به هوا می‌اندازد: **ئەی چۆن قەبووڵی ناکا،** سەمایشی بۆ دەکا›.

**کلاه خود را دودستی چسبیدن:** *[کنایی]* دەست بە کلاوی خۆوە گرتن/ بوون؛ لە بەرانبەر مەترسیەوە هەر ئاگاداری خۆ بوون ‹**کار به کار کسی نداشته باش!** کلاه خودت را دودستی بچسب!: **کارت بە کاری کەسەوە نەبێ!** دەست بە کلاوی خۆتەوە بگرە!›.

**کلاه خود را قاضی کردن:** *[مجازی]* خۆ نانە جێی کەسێک؛ بە ویژدانی خۆ دادوەری کردن ‹کلاهت را قاضی کن! **ببین انصاف است او را بیرون کنی؟:** خۆت بنە جێی ئەو! **بزانە ڕەوایە دەری بکەی؟**›.

**کلاه سر کسی رفتن:** *[کنایی]* کلاو چوونە سەر(ی) کەسێک؛ فریو خواردن ‹کلاه سرش رفت **که این ماشین را خرید:** کلاو چووە سەری ئەم **ماشینەی کڕی**›.

**کلاه سر کسی گذاشتن:** *[کنایی]* کلاو نانە سەر کەسێک؛ کەسێک خاپاندن/ فریو دان ‹**فروشنده** کلاه سرش گذاشت: **فرۆشیارەکە** کلاوی نایە سەری›.

**کلاه کسی با دیگری توی هم رفتن:** *[کنایی]* کلاو تێک گیران/ تێکچوون؛ لەگەڵ کەسێ تووشی شەڕ بوون ‹**اگر به این کار ادامه بدهی** کلاهمان توی هم می‌رود: **ئەگەر دەس لەم کارە بەر نەدەی** کلاومان تێکدەگیرێ›.

**کلاه کسی پس معرکه بودن:** *[کنایی]* دامان؛ کەوتنە بن کەنوو؛ کاری کەسێک بەرەو پێش نەچوون ‹**اگر دیر بجنبی** کلاهت پس معرکه است: **ئەگەر دێر بجووڵیەوە** دادەمێنی›.

**کلاه کسی پشم نداشتن:** *[کنایی]* داری دەمانچەی کەسێک شکان؛ بە ڕەبەی کەسێک نەپێوان؛ قسەی کەسێک بێ‌برەو بوون ‹کلاه کدخدا پشم نداشت **و کسی به او اهمیت نمی‌داد:** داری دەمانچەی کوێخا شکابوو، **کەس بە گوێی**

نەدەکرد›.

**کلاه کسی را برداشتن:** *[کنایی]* کلاو نانە سەری کەسێک؛ کەسێک فریو دان و زۆرتر شتێکی لێدزین.

**کلاه کسی را سر دیگری گذاشتن:** *[کنایی]* کلاوی مەلوێ کردنە سەر جەلوێ؛ سەت سەری بێ دەلاک تاشین؛ کلاوی کەسێک نانە سەر یەکێکی‌تر؛ بە فریو دانی خەلک یان بە گرتنی شتێک لە کەسێ و دانی بە دیتری گرفتی خۆ چارەسەر کردن: **کلاه ـ کلاه کردن**

**کلاه ـ کلاه کردن** ☜ **کلاه کسی را سر دیگری گذاشتن**

**کلاهبردار** / kolāhbardār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* دەسبڕ؛ دەزبڕ؛ گوێبڕ؛ گووشبڕ؛ جامباز؛ گەلاچ؛ گەلاچ؛ ڕیپۆ؛ ڕیپۆکار؛ خوافرۆش؛ ئاوانتەچی؛ ساختەچی؛ ساختەکار ‹معلوم شد فروشنده کلاهبردار است: دەرکەوت فرۆشیارەکە دەسبڕە›.

**کلاهبرداری** / kolāhbardārî ، ـها/: *اسم.* دەسبڕی؛ گزیکاری؛ جامبازی؛ کار و ڕەوتی فریو دانی خەلک زۆرتر بە مەبەستی تەڵەکە کردنی شتێک لێیان ‹در بازار کلاهبرداری کرده است: لە بازاڕدا دەسبڕی کردووە›.

**کلاه‌پشمی** / kolāhpašmî ، ـها/: *اسم.* لاتیە؛ لاتێ؛ دووقۆچکە؛ کلاوی لە خوری چێکراو یان لە خوری ئاخنراو.

**کلاه‌پوست** / kolāhpûst ، ـها/: *اسم.* شەکە؛ قەلپاخ؛ قەپلاخ؛ کلاوی لە پێستە مەڕ.

**کلاهخود** / kolāhxûd ، ـها/: *اسم.* کلاوخوود؛ کلاوزرێ؛ خوود؛ کوومزرخ؛ تاسکلاو؛ کلاوی وەک کاسەیەکی کانزایی بۆ بەرگری لە گەزن دیتنی سەر، کە لە شەڕدا لە سەری دەکەن: **خود؛ کُلاه آهنی**

**کلاهدوز** / kolāhdûz ، ـها؛ ـان/: *اسم.* کلاوچن؛ کلاودوور؛ کلاودروو؛ کەسێ کە کلاو بۆ فرۆشتن دەدروێ.

**کلاهدوزی** / kolāhdûzî/: *اسم.* کلاوچنی؛ کلاودووری: ۱. کار و ڕەوتی دوورینی کلاو ۲. /ـها/ کارگەی کلاوچنی.

**کلاه‌فرنگی** / kolāhfarangî/: [فارسی/ از فرانسوی] ☜ **کلافرنگی**

**کلاهک** / kolāhak ، ـها/: *اسم.* کلاوکە؛ کلاوە: ۱. بەشێ لە ئامێر کە وەک کلاوێک وایە و لە سەر نووک یان سەریەوە دادەنرێ ‹کلاهک موشک: کلاوەی مووشەک› ۲. سەرکلاو؛ بان‌کلاوە؛ سەرکلاوە؛ ئەوەی کە وەک کلاو کونێک دادەپۆشێ ‹کلاهک دودکش: سەرکلاوی دووکەڵ‌کێش›.

**کلاهگیس** / kolāhgîs ، ـها/: *اسم.* کلاوقژ؛ مووچاچ؛ مووچاخ؛ پرچی بەدەڵ؛ پرچی دەسکار؛ پۆشەنی دەسکردی قژ کە بۆ داپۆشانی تاسی یان گۆڕانی چار لە سەر دەکرێت ‹داماد کلاهگیس داشت: زاوا کلاوقژی هەبوو›.

**کلاه‌مخملی** / kolāhmaxmalî ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* *[مجازی]* جاهێل؛ لاتی بە ماریفەت ‹چند تا کلاه‌مخملی نشسته بودند و داشتند چای می‌خوردند: چەن جاهێل دانیشتبوون و چاییان دەخواردەوە›.

**کلاه‌نمدی** / kolāhnamadî ، ـها/: *اسم.* کلۆز؛ کلۆس؛ کلاوبۆرە؛ کلاوبۆرکە؛ کلاوبۆرگە؛ کلاوگەڕە؛ کولاف؛ کلاوی لە بەرگن چێ‌کراو.

**کلاهو** / kalāhû/ ☜ **کَلاکموش**

**کلاهی** [۱] / kolāhî/: *اسم.* *[گفتاری]* کلاوچن؛ کلاودروو؛ کلاودوور؛ کەسێ کە کلاو دەچنێ یان دەیفرۆشێ.

**کلاهی** [۲]: *صفت.* *[گفتاری]* کلاوبەسەر؛ کلاولەسەر؛ بەرامبەری مێزەر بە سەر ‹یک آقای کلاهی کنارشان نشسته بود: کابرایەکی کلاوبەسەر لە لایان دانیشتبوو›.

**کلب‌اصغر** / kalbe'asqar/: [عربی] ☜ سگ کوچک، **سگ**

**کلب‌اکبر** / kalbe'akbar/: [عربی] ☜ سگ بزرگ، **سگ**

**کلبتین** / kalbateyn, kalbatîn ، ـها/: [عربی] /سم. گاز؛ گازک؛ ماشەرز؛ کەلبەتان: ۱. ئامرازی بزمار کێشانەوە ۲. ئامرازێکی ددانبژیشکی بۆ دەرکێشانی ددان: **کعبتین**

**کلبه** / kolbe ، ـها/: /سم. کۆخ؛ کۆخک؛ کۆختە؛ قۆختە؛ کولوە؛ کۆلیت؛ قولیت؛ قۆخل؛ قوخڵ؛ کێپڵ؛ کاز؛ ماڵۆچکە؛ یانەکڵە؛ ماڵک؛ خانوچکەی زۆر بچووک و فەقیرانە.

**کلبی** / kalbî ، ـها؛ ـان؛ ـون/: [عربی] /سم. ۱. کەلبی؛ شوێنکەوتووی ئامۆژەیەکی کۆنی یۆنان کە دەڵێ دوورگرتن لە دنیا و گوێ نەدان بە داب و نەریتی کۆمەڵگا، ئەبێتە هۆی ڕزگاری ۲. *[مجازی]* سەگسار؛ کەسێ کە لە ئاکار و وتاردا بێچاوڕوویە.

**کلپتره** / kalpatre/: /سم. هەڵیتوپەڵیت؛ هەلەق ـ مەلەق؛ وڕکەوڕک؛ کەڵپەترە؛ قسەی هیچ و پووچ و بێمانا.

**کلت** / kolt ، ـها/: [فرانسوی] /سم. کولت؛ ناوی جۆرێ چەکی کەمەری.

**کلچیدن** / kalčîdan/: مصدر. لازم. بزڕکان؛ بزرقیان؛ هەڵبڕکیان؛ هەڵبزڕکان؛ پرووسقان؛ پڕوسقیان؛ بروسقیان؛ بزرقیەی؛ بزرقیای؛ بڕان/ بڕیانی شیر.

■ صفت مفعولی: **کلچیده** (بزڕکاو)/ مصدر منفی: **نکلچیدن** (نەبزڕکان)

**کلخوز** / kolxoz ، ـها/: [روسی] /سم. کەلخۆز؛ خرپە؛ ڕێخراوەی هەرەوەزی کشتوکاڵ لە سەردەمی یەکیەتی سۆڤیەت (شۆرەوی)دا.

**کلدانی**[1] / kaldānî/: [سامی] /سم. کەلدانی: ۱. تاقمێک لە خاچپەرستانی ئاسووری کە پاپ بە پێشەوای دینی خۆیان دەزانن ۲. /ـها؛ ـان/ هەر یەکە لە خەڵکی زاگەبەری وڵاتی کەڤنارای کەلدە لە بەینچۆمان ۳. زمانی ئەو هۆزە، لە زمانگەلی سامی.

**کلدانی**[2]: *صفت*. کەلدانی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە وڵاتی کەونارای کەلدە ۲. شوێنکەوتووی دەستەی کەلدانی.

**کلر** / k(o)lor/: [فرانسوی] /سم. کولۆر؛ توخمی کیمیاوی ناکانزای لە دەستەی هالۆژنەکان، بە ژمارەی ئەتومی ۱۷ و کێشی ئەتومی ۳۵,٤٥، گازێکی ژەهراوی بە ڕەنگی زەردی مەیلەو سەوز و بۆنی ناحەزە، کە بە شێوەی کلوروور لە ئاوی دەریا، سەوزی و شانگەلی گیانەوەریدا هەیە. لە دروستکردنی دەوا و دەرمان، ماکی پیسیلابەر، ڕەنگلابەر و هەروەها بۆ پالاوتنی ئاو بە کار دەڕوا.

**کلروفرم** / k(o)loroform/: [فرانسوی] /سم. کلورۆفۆرم؛ تراوی قورسی بێڕەنگ و هەڵچوو بە چێژەی شیرین و ناتێکەڵ لە ئاو کە لە بژیشکیدا وەکوو دەوای هۆشبەری بەکاردەچێ و لە پیشەسازیشدا کەڵکی هەیە.

**کلروفیل** / k(o)lorofîl/: [فرانسوی] /سم. سەوزینە؛ کلۆرۆفیل؛ ماکی سەوزی نێو شینایی و بنەمای دروستکردنی هیدراتی کەربون بە فوتۆسەنتیز.

**کلزا** / kolzā ، ـها/: /سم. کولزا؛ گیای ئالیکی لە چەشنی کەلەرم بە تۆمی چەورەوە کە بۆ دروستکردنی ڕۆنی گیایی بەرهەمی دێنن.

**کلسترول** / kol(l)est(e)rol, kolestrol/: [انگلیسی] /سم. کولیسترۆل؛ جۆری ئەلکولی بلۆری سپی یان زەردە کە لە ئاودا ناتوێتەوە و لە خوێن و مێشک و دەمار و جەرگ و سەفرادا دەورێکی گرینگی بۆ سووت و ساز هەیە و ویتامین «دێ»شی لێ بەرهەم دێ.

**کلسیم** / kalsiyom/: [فرانسوی] /سم. کەلسیوم؛ توخمی کیمیاوی کانزا، بە ژمارەی ئەتومی ۲۰ و کێشی ئەتومی ٤٠,٠٨، بە ڕەنگی سپی نەرم و تێکەڵ لە ئاودا کە خوێکانی لە سروشتدا زۆرە و

ماکی سەرەکی و گرنگی ژیانی گیانەوەران، سازێنەری ئێسک، ددان، گەلای داران و سەدەفە: **کالسیُم**

▣ **کلسیم کاربید:** ☜ کاربید کلسیم، **کاربید**

**کلش** / kolaš، ـها/:[کردی]/اسم. کولەش؛ کولۆش؛ کلۆش؛ قرش؛ لاسکی درووێنەکراو و وشکی خەلە، بەتایبەت گەنم و جۆ کە هێشتا نەکوتراوە.

**کلف** / kalaf، ـها/: [عربی]/اسم. پەڵە؛ خاڵ، بەتایبەت خاڵێ کە لە سەر خۆرەوە دەبینرێ.

**کلفت** / kolfat، ـها/: [عربی]/اسم. کلفەت؛ کلفەتە؛ تەیان؛ جێری؛ کارەکەرە؛ کارەکەر؛ قەرەواش؛ قەرواش؛ قەرەباش؛ خزمەتکار؛ ناقمالی؛ کەنیز؛ دەستەمۆ؛ خدامە؛ خەدامە؛ کچ یان ژنێک کە لە بەرانبەر وەرگرتنی پارەوە کاری مالداری و یانەوانی بۆ مالێک ئەنجام دەدا یان بەردەستی کەیوانووی مال دەکا.

**کلفت**[1] / koloft:/اسم./گفتاری/ قسەی ڕەق؛ قسەی ناشیرین و ناخۆش.

▣ **کلفت بار کسی کردن:** قسەی سووک لە پارسەنگی کەسێک نان؛ پلار لە کەسێک گرتن؛ قسەی تفت و تاڵ بە کەسێ گوتن ‹دو ماه اجاره‌خانه عقب افتاده، صاحبخانه هر روز کلفت بارمان می‌کند: دوو مانگە کرێ‌مالەکە کەوتۆتە دواوە، هەموو ڕۆژێ خاوەن مال قسەی سووکمان لە پارسەنگ دەنێ›.

**کلفت**[2]: صفت. ۱. ئەستوور؛ ستوور؛ قەبە؛ قۆڵ؛ قەبا؛ قەوی؛ قایم؛ قەیم؛ قەڵەو؛ کلفت؛ کولۆفت؛ کلوفت؛ بە کۆتەری زۆرەوە ‹چوب کلفت: داری ئەستوور› ۲. ئەستوور؛ ستوور؛ قۆڵ؛ قایم؛ هوڕ؛ بە مەودای زۆر لە نێوان دوو خاڵی بەرانبەر لە ڕووپەڕێکدا ‹پارچه‌ی کلفت؛ کاغذ کلفت: پارچەی ئەستوور؛ کاغەزی ستوور› ۳. گڕ؛ زل؛ کلفت؛ بۆڕ؛ قۆڕ؛ بەم ‹صدای کلفت: دەنگی گڕ› ٤. /مجازی، گفتاری/ مل‌ئەستوور؛ ئەستوور؛ بە هێز و توانا یان خاوەن پلەی کۆمەلایەتی ‹پارتی آزاد خیلی کلفت است: پارتی ئازاد زۆر مل‌ئەستوورە› ٥. /مجازی/ درشت؛ دشت؛ ڕەق؛ زل؛ ناخۆش؛ ناحەز ‹متلک کلفت: پلاری درشت›.

**کلفتی** / kolfatî/: [عربی]/اسم. کارەکەری؛ قەرەواشی؛ کلفەتی: ۱. پیشەی خزمەتکاری ژن ‹پنج سال در آن خانه کلفتی می‌کرد: پێنج ساڵ لەو مالەدا کارەکەری دەکرد› ۲. /مجازی/ کاری زۆر و بە زەحمەت و بێ‌پارە و مووچەی ژن یان کچێک ‹کار سارا شده بود کلفتی مادر و خواهر شوهرش: کاری سارا ببووە کارەکەری دوش و خەسووی›.

**کلفتی** / koloftî/:/اسم. ئەستووری؛ ستووری؛ قەڵەوی؛ کلفتی؛ کولوفتی؛ قۆلایی؛ قایمی؛ قەیمی؛ گزارە؛ دۆخ یان چۆنیەتی کولفت بوون ‹کتاب به این کلفتی را چطور تمام کردی؟!: کتێبێ بەم ئەستووریەت چۆن تەواو کرد؟!›.

**کلک**[1] / kalak، ـها/:/اسم. کەلەک: ۱. کەلێ؛ کەلەس؛ کەلەس؛ ئامێری پەڕینەوە لە سەر ئاو کە لە بەستنەیەکەوەی چەند کۆتەدار، خیگە یان بەرمیل دروست دەکرێ ۲. /گفتاری/ فێل؛ گزی؛ ڕەتم؛ ڕیوم؛ کەلەکە؛ گەژی؛ زیچک؛ لێپ؛ لیپ؛ خاپ؛ گزە؛ ئەروەند؛ گەڕ؛ ڕاو؛ دەهۆ؛ فەن؛ بەن؛ فەند؛ فەنە؛ هەنگ؛ هوقە؛ گزی و فێل ۳. مەنگەلی لە سواڵەت.

▣ **کلک چیزی را کندن:** /مجازی/ ۱. گێچەلی شتێک برینەوە؛ کارێک تەواوکردن ‹ کلک کار را کندن: گێچەلی کارەکە برینەوە› ۲. بێخی شتێک دەرهێنان؛ قرتک/ چۆڕ لە چتێک برین؛ تاقی شتێک نەهێشتن؛ ئاو دانە بێخ چتێکا؛ دەس لە ئاخری شتێکەوە دەرهێنان؛ خواردن یان تەواو کردنی شتێک ‹در عرض یک هفته کلک پول‌ها را کند: لە حەوتەیەکدا بێخی پوولەکانی دەرهێنا›.

**کلک خوردن:** فریو خواردن؛ خەلەتان؛

خلــەتان؛ خاپــان؛ خاپیــان؛ خــاپین؛ هەڵخەڵەتان؛ غەرین؛ لێپ خارن؛ خەڵەتیەی؛ گوڵ واردەی؛ خڵەتیای؛ تـەفرە خـواردن؛ بـە فریـو چـوون؛ لـە خشـتە چـوون؛ فریبیـان؛ خلافان؛ خلەفان؛ هەربلین ‹باور نمی‌کردم به این سادگی کلک بخورد: بڕوام نـەدەکرد بـەم هاسـانیە فریو بخوات›.

**کلک زدن**: فێڵ کردن؛ گزیکاری کـردن؛ گـەڕ/ گزی کردن ‹دیدی چطور به پدرش کلک زد: دیتت چۆن فیلی لە بابی کرد›.

**کلک سـوار کـردن**: *[مجازی]* فـێڵ دیتنـەوە؛ فێڵەبازی کردن؛ فروفێڵ کـردن ‹هـر روز کلـک تازه‌ای سوار می‌کرد و از کار در می‌رفت: هەر ڕۆژێک فیلـێکی تـازەی دەدیتـەوە و لـە ژێـر کـار دەردەچوو›.

**کلک کسی را کندن**: *[مجازی]* فەراقی ڕەش لە کەسێک برین؛ بە ڕیشـەی کەسـێکدا چوونـە خوار؛ تەفر و توونـا خسـتنی کەسـێک؛ سـەر کەسێک کردنە گۆمدا؛ کوشتن، بەزاندن یـان دەرکردن و دوور خستنەوەی کەسێک ‹سه تا چاقوکش ریختند سر آرام و کلـک او را کندنـد: سـێ چـەقۆکێش بـەر بوونـە گیـانی ئـارام و فـەراقی ڕەشیان لێبری›.

**کلک**[۲] / ـها/: *صفت. [گفتاری]* فێڵباز؛ زۆڵ؛ فریوباز؛ کەلاجۆیـە؛ فـێلاوی؛ گزیکـەر؛ کەڵـەکبـاز؛ گرنی‌باز؛ حەکەباز؛ ناقس؛ گەڕسـاز ‹خیلی کلـک است، سر همـه کـلاه مـی‌گـذارد: زۆر فیلـبازە سـەری هەمووان کلاو دەنێ›.

**کلـک** / kelk ، ـهـا/: *اسم. [ادبی]* ۱. پێنـووس؛ قەڵەم؛ قامیش؛ بنـووس؛ قەڵـەمزەل ۲. کـەلپ؛ کـەلم؛ کەڵـپ؛ کەڵـپە؛ کەلبـە؛ کلـب؛ کەڵـب؛ کەڵـبە؛ کەڵـوە؛ دڕۆک؛ قیـل؛ چـوار ددانی پێشەوەی گیانەوەرانی دڕندە.

**کلکسیون** / kol(l)eksiyon ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* بەرهەفۆک؛ کولیکسـیۆن؛ کۆمەڵـی خـڕکراوەی شتێک (وەک بەرهەمی هونـەری، مێژوویـی، تـەمر یان شەمچە).

**کلکسیونر** / kol(l)eksiyoner ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* کەسـێ کـە بەرهەفـۆک خـڕ دەکاتـەوە و ئاگاداریان لێوە دەکات.

**کلگی** / kallegî ، ـها/: *اسم.* کـلاوە؛ سـەرکلاوە؛ سـەرکلاو؛ شـتێکی وەکـوو کـلاو لـە سـەرووی دەسگایەکەوە.

**کلم** / kalam ، ـها/: *اسم.* کەلەم؛ کەلەرم؛ لەهانە؛ لەهەن؛ لانە؛ گیای یـەک یـان دوو سـالان، بـە گەڵای پانی سپی، سەوز یان بنەوشەوە.

▣ **کلـم بروکسـل**: کەلـەرمی بنـەوش؛ جـۆری کەلەرمی گەڵا بنەوشی پان و ئەستوور کە بـۆ سالاد دەبێ: **کلم بنفش**

**کلم بنفش** ☜ **کلم بروکسل**

**کلم پیچ**: کەلەم پێچ؛ جۆری کەلەرمی تۆپـەڵ بە گەڵای چرچ و لۆچ و تورتەوە.

**کلـم قمـری**: قـومری؛ داش‌کەلـەم/ کەلـەرم؛ کەلەمووک؛ کەلەمۆ؛ کەلەمی؛ جۆری کەلـەرم کە لە تەختی خاکەوە خڕ هەڵدێ و گەڵاکانی بە سەریدا دەڕوێ.

**کلم گل**: گوڵەکەلەم؛ گوڵ‌کەلەرم.

**کلمات** / kalamāt, kalemāt/: [عربی] جمعِ ☜ **کلمه**

▣ **کلمات قصار**: قسەی نەستەق؛ سارستە؛ ڕستە یان زاراوەیەکی کورت و ئامۆژگاریدەر.

**کلمبیم** / kolombiyom/: [فرانسوی] ☜ **نیوبیُم**

**کلم‌پلـو** / kalampolow, -polo/: *اسم.* کەلـەم/ کەلەرم‌پلاو؛ چەشنێ پلاو کە گۆشت، کەلەرمـی جنراو و مزرەمەنی تێدەکەن.

**کلمن** / kalaman/: [عربی] *اسم.* کەلەمەن؛ نێوی چوارەمین گرۆی پیتی ئەبجەد.

**کلمـن** / kolman ، ـهـا/: [؟] *اسم.* کولمـەن: ۱. ناوی بازرگـانی چەشـنێ یەخـدان ۲. نـاوی بازرگانی کەرستەیێک بـۆ هەڵـگرتنی یـەخاو و

خواردنەوەی سارد کە زۆرتر دەرگا و شێری هەیە و لە سەفەردا بە کار دەڕوا.

**کلموک** / kalmûk/: *اسم.* کەلمووک: ۱. هۆزی زەردپێست لە تۆرەمەی مەغوول کە ئێستە زۆرتر لە باکووری دەریای خەزەر نیشتەجێن ۲. /ـها/ هەر یەکە لە کەسانی ئەو هۆزە ۳. زمانی ئەو هۆزە لە زمانگەلی مەغولی.

**کلمه** / kalame, kaleme ، ـها؛ کلمات/: [عربی] *اسم.* وشە؛ وتە؛ گوتە؛ کوتە؛ واژە؛ وێژە؛ بێژە؛ لێمە؛ لێما؛ دروشە: ۱. چکۆلەترین یەکەی وتار یان نووسراوەیەک کە بە تەنیایی مانایەکی پێیە ‹یک کلمه با من حرف نزد: وشەیەکی لەگەڵم دوولەت نەکرد› ۲. هەر یەکە لە بەشگەلی ڕستەیەک کە بە مەودا یان نیشانەی خالبەندی لێک جودا دەبنەوە ‹این سطر ۸ کلمه است: ئەم دێڕە ۸ وشەیە›.

**کلمه‌سازی** / -kalamesāzî, kaleme ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* وشەسازی؛ کاری دروست کردن و داهێنانی وشە بە پێی ئەلفوبێتکە.

**کلنجار** / kalancār/: *اسم.* کار و ڕەوتی سەر نیانە سەر؛ کردەوەی هاوڕێ لەگەڵ کۆششت، شەڕ و هەرا و مەزات لەگەڵ شتێ یان کەسێکدا ‹یک روز تمام با کولر کلنجار رفت تا درستش کرد: ڕۆژێکی تەواو سەری نایە سەر کوولێرەکە تا خاسی کرد›. هەروەها: **کلنجار رفتن**

**کلنگ** / kolang ، ـها/: *اسم.* قولنگ؛ قولەنگ: ۱. قولنگە؛ قولینگ؛ قولەنگە؛ قولنگە؛ کۆلەک؛ زەنگن؛ زەنگەن؛ قەزمە؛ قازمە؛ سنکۆلک؛ کولینگ؛ پاچ؛ پارچ؛ پارج؛ نالجاخ؛ پاچی دووسەر؛ قازمە؛ ئامێری کانزایی بۆ زەوی کەندن و بەرد شکاندن و... بە دەمێکی تیژ و دەمێکی پان و دەستەیەکی دارینەوە ‹کلنگ را برداشت و شروع کرد به زمین کندن: قولنگەکەی هەڵگرت و دەستی کرد بە زەوی کەندن› ۲. قولنگ؛ قورینگ؛ قورنگ؛ قازیقولنگ؛ قازیقولینگ؛ شینەقورینگ؛ قولینگە؛ قەتارقولینگ؛ پەلەوەری کێوی بە لەش و مل و پەلی درێژ، دندووکی بڵیند و ئەستوورەوە.

▣ **کلنگ جایی را به زمین زدن:** بنەڕەتی جێگایەک دانەوە؛ کردنەوەی جێگایەک دەست پێکردن ‹رییس‌جمهور کلنگ بیمارستان را برای سومین بار به زمین زد: سەرۆک‌کۆمار بنەڕەتی نەخۆشخانەکەی بۆ سێهەمین جار دایەوە›.

**کلنگی** / kolangî/: *صفت.* کۆنەماڵ؛ ماڵی کۆنەی شیاوی ڕووخاندن.

**کلنل** / kol(o)nel ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* سەرهەنگ؛ ئەفسەری خاوەن پلە و پایەی سەرهەنگی.

**کلنی** / kolonî ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ۱. *[نامتداول]* موستەعمیرە؛ وڵاتی دەست بە سەردا گیراو ۲. کۆچنشین؛ کۆچەرنشین ۳. کۆمەڵە خەڵکی هەندەرانی دانیشتووی شارێک ٤. *[زیست‌شناسی]* سەرجەمی باکتری هەڵهاتوو لە شوێنێک کە بڕی جار لە ملیۆنیش پترە.

**کلوئید** / kol(l)o'îd ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* *[شیمی]* کولۆیید؛ تێکەڵاوی چەند جۆر وردەماکی هاوچەشن لە باری قورسیەوە (زۆرتر) لە تراوێکدا.

**کلوئیدی** / kol(l)o'îdî/: [فرانسوی] *صفت.* کولۆییدی؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی کولۆییدەوە ‹شیر یک مادەی کلوئیدی است: شیر ماکێکی کولۆییدیە›.

**کلوب** / kulûb ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* گازتین؛ گاستین؛ یانە؛ یانی؛ یان؛ جێ کۆ بوونەوە بۆ سانەوە: **کلوپ**

**کلوپ** / kulûp/: [از فرانسوی] ☜ **کلوب**

**کلوته** / kolûte ، ـها/: [از کردی] *اسم.* *[قدیمی]* ۱. کلێتە؛ کلیتێ؛ سەرکلاوەی بەن ۲. کۆچکە؛ قۆچکە؛ کۆچک؛ قۆچک؛ قۆلەقۆچکە؛ سەرپۆشێ کە لە بەرچەنەوە دادەخرێ، زۆرتر بۆ زارۆکی

دەبەستن و هێندێک ژنی عێلاتیش بە سەریدا دەدەن.

**کلوچه** / kulûče, kolûče ، ـها/:/اسم. کولیچە؛ کلۆچ؛ کلیچ؛ کلیچە؛ کلێچە؛ کلووچە؛ کولووچە؛ کولووچێ؛ چەشنێ نانی شیرینی وشک کە لە ئارد، ڕۆن، هێلکە و تۆزێ شەکر دروستی دەکەن.

**کلوخ** / kulûx, kolûx/:/اسم. کلۆ؛ کەستەک؛ کەستک؛ کێستەک؛ کەرسەک؛ کەرسەگ؛ کولات؛ کرێت؛ کولۆ؛ کولوە؛ کلۆگل؛ کەلمتە؛ گورمک؛ کەملتە؛ گلمەت؛ گلمت؛ گلمتک؛ گوندە؛ مەدەر؛ گوومتل؛ کلۆسن؛ سمتەگل؛ سندەگل؛ سندە؛ سن؛ خەرسەک؛ تۆژلاخ؛ کۆمای پێکەوە لکاوی گلی وشکەڵاتوو.

**کلوخ‌کوب** / kulûxkûb, kolûx- ، ـها/:/اسم. [کشاورزی] کلۆکوتە؛ سندەکوت؛ ئامێرێکی وەک حورتەکی گەورە بە دەستەیەکی درێژەوە بۆ ورد کردنی کەستەک و تەخت‌کردنی زەوی.

**کلوخه** / kulûxe, kolûxe ، ـها/:/اسم. ۱. کولۆ؛ کولوە؛ کەلپ؛ کەلب؛ پرت؛ گومتل؛ کول؛ پارچۆکە؛ کومتل؛ کەڵبە؛ کۆمایەکی خۆگر بە بیچمی نارێکەوە ‹کلوخەی قند: کولۆی قەند› ۲. [بنایی] کەلووک؛ کەلووکە؛ لەتە ئاجۆرێک بە ئەندازەی یەک لە هەشتی ئاجۆرێکی ساق.

**کلوک؛ کلوکه**

**کلوزآپ** / k(e)lowzāp/: [انگلیسی]/اسم. وێنە (ڕەسم یان فیلم) لە مەودای نزیکەوە.

**کلوزار** / kolûzār ، ـها/:/اسم. کەرکیت؛ کەڵکیت؛ دەف؛ دەفە؛ ئامرازێکی کانزایی شانەئاسا بۆ کوتاندنەوەی پۆی قالی.

**کلوش** / keloš/: [فرانسوی]/اسم. کەلەوش؛ چەشنێ برشتی لە سەرەوە تەنگ و لە خوارەوە هەراو ‹دامن کلوش: دامێنی کەلەوش›.

**کلوک** / kulûk, kolûk/ ☜ **کلوخه ـ۲**

**کلوکه** / keloke/: [؟]/اسم. ئەشک؛ پارچەی سووکی لە بەن، پەموو یان هەودای دەسکرد بە نەخشی زۆپەوە کە زۆرتر بۆ چارشێوی ڕەش بەکاری دەبەن.

**کلوکه** / kulûke, kolûke/ ☜ **کلوخه ـ۲**

**کلون** / kulûn, kolûn ، ـها/:/اسم. [قدیمی] کۆم؛ کولۆم؛ کلۆم؛ فەراشتە؛ فەراشە؛ شەوژەن؛ کلیل و گۆلە؛ کلیل و گۆل؛ کلێل و کۆم؛ کلیل و کۆم؛ ئالقەی دارین یان کانزایی درگا داخستن.

**کله**[۱] / kalle ، ـها/:/اسم. [گفتاری] سەر: ۱. پۆپە؛ چلەپۆپە؛ قەلەپۆپە؛ سەرقەل؛ دوچک؛ قووچکە؛ تروپک؛ ترۆپک؛ سلتان؛ بانترین خالی جێگا یان شتێک ‹کلەی درخت: پۆپەی دار› ۲. کەلە؛ کلۆخ؛ کەلێ ‹با کلەی تراشیدە می‌رقصید: بە سەری تاشراوەوە هەڵدەپەڕی› ۳. [مجازی] کەلە؛ کەلێ؛ زەین؛ بیر؛ ویر ‹نمی‌دانم در کلەی تو چە می‌گذرد: نازانم چت لە سەردایە› ٤. [مجازی] هۆش؛ کەلە؛ توانایی زەینی ‹باکلە: بەهۆش› ٥. کەلە؛ کاتات؛ کاتک؛ کات؛ کاژە؛ کاژەلە؛ کاژەڕە؛ کاژەلاک؛ قاف؛ قەحف؛ سەری چوارپێیانی حەلال‌گۆشت، بەتایبەت مەڕ ‹دو تا کلە خریدیم و چهارتا پاچە: دوو سەر و چوار پێمان کری›.

▣ **کلەی سحر**: کازێوە؛ کازیوە؛ سپێدەی بەیانی؛ سەلای سوح؛ دەمی بەیان؛ سەر لە بەیانی.

⊡ **کلەی خود را بە کار انداختن**: [مجازی] عەقڵی خۆ گردەوکردن؛ بیری خۆ گلێرکردنەوە؛ لە هزر و بیری خۆ کەڵک گرتن ‹کلەات را بە کار بیانداز!: عەقڵت گردەوکە!›.

**کله کردن**: ۱. هەڵگەڕاندنەوە؛ هەڵەوگەڕاندن؛ سەرەوخوارکردن؛ هۆرویلانایوە؛ وەل‌ودیم کەردەی ‹فرغون را پای دیوار کلە کرد: فیرغوونەکەی لە پەنا دیوارەکەدا هەڵگەڕاندەوە› ۲. [مجازی] ڕاونان؛ ڕەواندن؛ تاراندن ‹اول صبح مشتری را کلە نکن!: سەر لە بەیانی مشتری ڕاو مەنێ!›. هەروەها: **کلەشدن**

**کلەی کسی باد داشتن**: [مجازی، گفتاری] سەر

بەتەم بوون؛ بادی هەوا بوون ‹هنوز کله‌ات باد دارد و با تو نمی‌شود حرف زد: هێشتا سەرت بەتەمە و قسەت لەگەڵ ناکرێ›.

**کلهٔ کسی بوی قرمه سبزی دادن:** *[مجازی]* سەری کەسێک بۆ گۆنگەلان خوران؛ سەری کەسێک لێ خوران/ جوولانەوە؛ قسەی مەترسیدار (زۆرتر دژ بە حکوومەت) گوتن ‹آقا کله‌اش بوی قرمه‌سبزی می‌دهد: کاکەم سەری بۆ گۆنگەلان دەخورێ›.

**کلهٔ کسی خوب کار کردن:** *[گفتاری]* مێشکی کەسێک باش کارکردن؛ ئاقڵ و هۆشیار بوونی کەسێک.

**کلهٔ کسی داغ شدن:** *[مجازی]* چاوی کەسێک پەڕینە تەوقی سەری؛ سەری کەسێک داخ‌کردن؛ دین لە لا کەسێک نەمان؛ زۆر تووڕە بوون ‹وقتی این منظره را دیدم کله‌ام داغ شد: کاتێ ئەو دیمەنەم بینی چاوم پەڕیە تەوقی سەرم›.

**کلهٔ کسی گرم شدن:** *[مجازی]* سەرخۆش بوونی کەسێک؛ مەست/ مەس کردن ‹وقتی چند استکان خورد و کله‌اش گرم شد، افتاد به پرحرفی: هەر کە چەند پیالەی خواردەوە و سەرخۆش بوو، دەستی کرد بە چەنەبازی›.

**به کلهٔ کسی زدن:** *[مجازی]* بە سەری کەسێکدا هاتن؛ ژیری و توانی لێکدانەوە لا نەمان ‹یک دفعه زد به کله‌اش و شروع کرد به داد زدن: لەپڕ بە سەریدا هات و دەستی کرد بە هاوار و داد›.

**کله**[2]**:** *قید.* ۱. بە سەردا؛ بە ڕاوەستاو. بەرانبەر: **راسته** ‹آجرها را کله بچین!: ئاجۆرەکان بەسەردا بچنە!› ۲. چڵەپۆپە؛ پۆپە؛ ترۆپک؛ تروپک؛ دوند؛ زەنگوڵ؛ سەرقەل ‹نشسته بود کلهٔ درخت: لە چڵەپۆپەی دارەکەوە دانیشتبوو›.

**کله / kele/:** *اسم.* ۱. تەقەڵ؛ کاری جارێک تێڕۆکردن و دەرهێنانی شتێک (وەک دەرزی)

۲. *[مستهجن]* کوت؛ پەیکوت؛ گۆت؛ حینچکە؛ فنچک؛ فرچک؛ سووک؛ سۆک؛ تەکان و شەکانی کاتی هاوجێیی.

**کله پا / kallepā/:** *صفت. [گفتاری]* واژۆ؛ نقۆت؛ قڵپ؛ سەر و ژێر؛ سەرنخوون؛ سەرنەخوون؛ سەرنەخووین؛ سەرنوخوون؛ سەرنوخین؛ سەرەونخوون؛ سەرەونگوون؛ سەرنگووم؛ سەرەونگوم؛ ژێرەوژوور؛ ژێرورووو؛ ژێروبان؛ وەڵودیم؛ سەرەونوون.

⊡ **کله پا شدن:** ۱. هەڵگەڕانەوە؛ سەرنخوون بوون؛ واژۆ بوون؛ ئەوەنوونیەی؛ نوونیایوە؛ هۆرویڵیەی ‹مواظب باش سماور کله‌پا نشود: وریا بە سەماوەرەکە هەڵنەگەڕێتەوە› ۲. *[کنایی]* ڕەت بردن؛ قۆرت دان؛ ساتمە بردن؛ هەڵەنگووتن؛ هاوسەنگی و ساغی خۆ لە دەست دان ‹چند قدم نرفته بود که کله‌پا شد و سرش خورد به دیوار: چەند هەنگاوێک نەڕۆیشتبوو ڕەتی برد و سەری دای بە دیواردا› ۳. *[مجازی]* کەوتنە لای ماڵ؛ تووشی نەخۆشی گران بوون ‹بعد از آن اتفاق یک ماه کله‌پا شد: دوای ئەو ڕووداوە مانگێک کەوتە لای ماڵ›.

**کله پاچه / kallepāče/:** *اسم.* سەروپێ؛ سەروپا؛ سەروپاچک؛ سەرەوپا؛ سەروپێچک؛ کەلەپاچە؛ کەلوپا؛ کەلوپاچە؛ کەلوپاچکە؛ کەللەپاچە؛ کەلپاچە: ۱. ـها/ پاچکە؛ پاچە؛ پایە؛ پەل و سەری ئاژەڵ بە بردراوی ۲. چێشتی سەروپێ.

**کله پز / kallepaz، ـها/:** *اسم.* کەلەپەز؛ کەسێ کە کاری لێنانی سەروپێیە.

**کله پزی / kallepazî/:** *اسم.* کەلەپەزی: ۱. کاری لێنانی سەر و پێ ۲. ـها/ دووکانی لێنان و فرۆشتنی چێشتی سەروپێ.

**کله پوک / kallepûk، ـها/:** *صفت. [مجازی، گفتاری]* سەرخلۆل؛ سەرکوێر؛ سەرپووت؛ دەبەنگ؛ بێمێشک؛ بێمەژگ.

**کله‌جوش / kallecûš/** ☜ **کالجوش**

**کلەخر** / kallexar ، ـها/: صفت. *[مجازی، گفتاری]* سەرەوڕۆ؛ گاگوو؛ نەترسی بێ‌ئاوەز. هەروەها: **کلەخری**

**کلەخشک** / kallexošk, -xošg/: صفت. *[مجازی، گفتاری]* مێشک‌وشک؛ دڵ‌ڤەرسیای؛ بەبێ هێزی زەینی بۆ نوێ‌کردنەوە و بەدیهێنان.

**کلەدار** / kalledār ، ـها/: صفت. *[گفتاری]* زیرەک؛ زرنگ؛ زرینگ؛ زانا؛ ئاقڵ.

**کلەشق** / kallešaq(q) ، ـها/: [فارسی/ عربی] صفت. *[گفتاری]* لاسار؛ سەرڕەق؛ کەلەڕەق؛ کەلەشەق؛ خاوەن هۆگرەتی بە لاساری و گوێ‌نەبیسی ‹خیلی کلەشق است، جواب همە را با فحش می‌دهد: زۆر لاسارە، وەلامی هەموو بە جنێو دەداتەوە›.

**کلەشقی** / kallešaq(q)î ، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. *[گفتاری]* لاساری؛ سەرڕەقی؛ کەلەڕەقی؛ کەلەشەقی؛ سەربزێوی و پێ‌چەقێنی لە بەرانبەر نەویستەوە ‹این‌قدر کلەشقی نکن! بیرونت می‌کنند: ئەوندە لاساری مەکە! دەرت دەکەن›.

**کلەقند** / kalleqand ، ـها/: [فارسی/ معرب] اسم. کەللەقەند؛ کەلەقەن؛ کەلەشەکر؛ کەللەشەکر؛ شیلە شەکری دە قالب‌کراوی وشکەوەبوو.

**کلەقندی** / kalleqandî/: [فارسی/ معرب] صفت. کەللەقەندی؛ بە شێوەی کەللەقەند.

**کلەکوت** / kallekût/: صفت. *[مجازی]* قەلاپەچن؛ قەلاچین؛ قەلاتە؛ لە سەر یەک هەڵچنراو.

**کلەگنجشک** / kallegonceŠk, -gonceŠg/: اسم. سەرەچۆلەکە؛ سەرمەلیچک. هەروەها: **کلّەماهی**

▣ **کلەگنجشک خوردن**: *[مجازی]* ئەلفلەیلە خوێندن؛ مێشکی کەر خواردن؛ زۆربلێیی کردن؛ فرەوێژی/ چەنەبازی‌کردن ‹چقدر حرف می‌زنی! مگر امروز کلەگنجشک خوردی؟: چەندە قسە دەکەی! مەگەر ئەوڕۆ ئەلفلەیلەت خوێندوە؟›.

**کلەگندە** / kallegonde ، ـها/: صفت. *[تعریض]* سەرزل؛ سەرتۆپز؛ کەلەزل؛ مل‌پان؛ بە هێز و کارتێکەری کۆمەڵایەتیەوە ‹هر چیز خوب نصیب آن همسایەی کلەگندە می‌شد: هەموو شتێکی باش دەبووە بەشی ئەو دراوسێیە سەرزلە›.

**کلەمعلق** / kallemo'allaq/: [فارسی/ عربی] صفت. *[گفتاری]* سەرنخوون؛ نخوون؛ واژۆ؛ سەرەوخوار.

▣ **کلەمعلق زدن**: سەرمەقولات لێدان؛ سەپلەقولاتێ کردن.

**کلەمعلق شدن**: سەرەونخوون بوون؛ سەرنخوون بوون؛ نخوون بوونەوە؛ وەرگەڕان؛ ژێرورووو بوون؛ واژی بوون؛ بەراوەژوو بوون؛ ئاوەژوو بوون؛ سەرەونوون بیەی؛ ئەوەنوونیەی؛ وەلۆدیم بیەی؛ قلّپ بوونەوە؛ نوقم بوونەوە؛ قولەوژوور بوون؛ قولّب بوون؛ دەمەوخوار بوون ‹از بالای درخت کلەمعلق شد، سرش شکست: لە سەر دارەکەوە سەرەونخوون بوو، سەری شکا›.

**کلی** / kolî ، ـها/: [؟] اسم. ۱. کارتونی بچووک ۲. بەستە؛ بەسە.

**کلی**[1] / kollî/: [عربی] صفت. ۱. مشەمەر؛ زۆر و زەبەند؛ فرە و فراوان. بەرانبەر: **جزئی** ‹خرید کلی: کڕینی مشەمەر› ۲. گشتی؛ هەموانی؛ سەرجەم ‹تصویر کلی: وێنەی گشتی›.

**کلی**[2]: قید. ۱. زۆرێک؛ گەلەک؛ فرەییەک؛ زۆر و زەبەن؛ زۆر و زەوەند؛ فرە و فراوان ‹کلی خرید کردم: زۆرێک شتم کڕی› ۲. سەرجەم؛ بە گشتی؛ بەبێ وردکردنەوە و تا و توێ دەرهێنان.

**کلیات** / kollîyyāt/: [عربی] اسم. ۱. جمع ☜ **کُلّیّت** ۲. سەرجەمی بەرهەم؛ کۆی نووسراوەی نووسەر یان شیعری شاعیرێک.

**کلیپس** / kilîps, kelîps ، ـها/: [از انگلیسی] اسم. کلیپس: ۱. ئامێرێکی کانزایی یان پلاستیکی بە شێوەی مێلەیەکی چەماوە بۆ گیر دانی چەند لاپەڕە کاغەز و مقەوا لە سەر یەک ۲. گیرە.

▣ **کلیپس زدن**: گیرە لێدان؛ کلیپس دان؛ بە

کلیپس بە یەکەوە چەسپاندن.

**کلیت** / kolit/: [فرانسوی] ☜ **کُولیت**

**کلیت** / kollîyyat، ـها؛ کلیّات/: [عربی]/اسم. سەرجەمی؛ مشەمەری؛ دۆخ یان چۆنیەتی گشتی بوون.

**کلیتاً** / kollîyyatan/: (!)[عربی] قید. بە تێکڕایی؛ سەرجەم؛ بە گشتی.

**کلیجه** / kolîce، ـها/: [کردی]/اسم. [قدیمی] کولیجه؛ کولەجە؛ کولجە؛ کولەنجە؛ کولەجە؛ کلجە؛ کلۆجە؛ کولۆنجە؛ کولنجە؛ کولیژە؛ کولەجی؛ بالاپۆشێکی لە خوری چنراو.

**کلید** / kilîd, kelîd، ـها/: [یونانی]/اسم. کلیل؛ کلێل: ١. ئاچەر؛ هاچەر؛ هاچار؛ ئامێری کردنەوە و بەستنی قوفڵ ‹کلید در: کلیلی دەرگا› ٢. ئامێری وەگەڕ خستن و قەت‌کردنی ڕەوتی کارەبا لە خولگەیەکدا ‹کلید برق: کلیلی کارەبا› ٣. [موسیقی] نیشانەیەکی تایبەتی بۆ دەسپێکی نوت لە سەر دێڕی نوت‌نووسی (وەک کلیلی سول، کلیلی فا) ٤. شتێک بۆ بازکردنی ڕەمز یان هەڵێنانی مەتەڵێک.

⊡ **کلید انداختن**: کلیل (تێ)خستن؛ بە کلیل قوفل‌کردنەوە.

**کلید** زدن: ڕۆشن‌کردن؛ ترازنەی؛ هەڵکردن؛ بە کار خستنی ئامێر یان دەسگایەک (وەک ڕێخستنی دووربینی وێنەهەڵگری).

**کلید کردن**: قوفڵ‌کردن: ١. سفت و سۆڵ بەستن ‹دندانهایش را کلید کرده بود: ددانی قوفڵ کردبوو› ٢. کلیل‌کردن؛ داخستن؛ کرێڵ کەردەی؛ گاڵە دان؛ بەستن بە کلیل ‹در را کلید کردی؟: درگاکەت قوفل کرد؟›. هەروەها: **کلید شدن**

**کلیدسازی** / kilîdsāzî, kelîd-/: [یونانی/ فارسی] اسم. کلیل‌سازی؛ کلێل‌سازی: ١. /ـها/ کارگای دروست‌کردنی کلیل ٢. کاری دروست‌کردنی کلیل. هەروەها: **کلیدساز**

**کلیدی** / kilîdî, kelîdî/: [یونانی] صفت. [مجازی] سەرەکی؛ گرنگ؛ گرینگ ‹پست کلیدی: پایەی سەرەکی›.

**کلیس** / kolis، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کولیس؛ جۆری ئامرازی پێوانی زۆر بە وردی مەودا.

**کلیسا** / kilîsā, kelîsā/: [یونانی]/اسم. کلیسا؛ کلێسە؛ کەنیسە: ١. /ـها/ پەرستگای خاچپەرستان: **کلیسیا** ٢. مەزهەبی خاچپەرستی، بەتایبەت لە ئاماژە بە ڕێخراوە و پێکهاتەکەیدا ‹کلیسای کاتولیک: کلیسەی کاتولیک›.

⊡ **کلیسای ارتدکس** ☜ مذهب ارتدکس، مذهب. هەروەها: **کلیسای آنگلیکان؛ کلیسای پرتستان؛ کلیسای کاتولیک**

**کلیسای جامع**: کلێسەی سەرەکی؛ ئوسقوف‌نشینێک، کە زۆرتر ئوسقوف یان سەرئوسقوف تێیدا نوێژ دەکا.

**کلیسای روم**: مەزهەبی کاتولیک.

**کلیسای شرق**: مەزهەبی ئورتودوکس.

**کلیسائی** / kilîsā'î, kelîsā'î/: [یونانی] ☜ **کلیسایی**

**کلیسایی** / kilîsāyî, kelîsāyî/: [یونانی] صفت. کلیسایی؛ کلێسەیی؛ کەنیسەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کلیساوە ‹آموزشهای کلیسایی: فێرکاری کلیسایی›: **کلیسائی**

**کلیسیا** / kilîsiyā, kelîsiyā/: [یونانی] ☜ **کلیسا ـ ١**

**کلیشه** / kilîše, kelîše، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کلیشە: ١. پارچە کانزایەک لە ئالیاژی ڕۆح، کە وێنە یان نووسراوەیەک بۆ چاپ لە سەری هەڵهاتووە ٢. [مجازی] وێنەی چاپی.

⊡ **کلیشه کردن**: کلیشەکردن؛ بە شێوەی وێنەیی چاپ‌کردن.

**کلیشه‌ای** / kilîše'î, kelîše'î/: [فرانسوی] صفت. کلیشەیی؛ کلێشەیی: ١. بە شێوەی کلیشە

‹چاپ کلیشـەای: چـاپی کلیشـەیی› ۲. *[مجـازی]* قالبی؛ بە شێوەی لە پێشەوە دانراو و بێ ئـەوەی هیچجۆرە نوێکارییەکی تێدا هەبێ.

**کلیشـەسـاز** / kilîšesāz, kelîše- ، ـهـا؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسـی]/*سم.* کلیشەسـاز؛ کەسـێ کـە کاری دروستکردنی کلیشەیە.

**کلیشەسـازی** / kilîšesāzî, kelîše-/: [فرانسـوی/ فارسـی]/*سم.* کلیشەسـازی: ۱. کـاری دروسـت کردنی کلیشە ۲. پیشـەی کلیشەسـاز ۳. /ـهـا/ کارگای کلیشە دروستکردن.

**کلیک** / kilîk, kelîk ، ـها/:/*سم.* تووتـە؛ گولـێ؛ قامکی چکۆلە؛ چکۆلـەترین ئەنگوسـتی دەسـت یان پێ.

**کلیمی** / kalîmî ، ـها؛ ـان/: [عربی]/*سم.* کـەلیمی؛ یەهوودی؛ مووسایی؛ جوو.

**کلیـنکس** / kilîneks, k(e)lîneks/: [انگلیسـی] /*سم.* کیلینیکس؛ نـاوی بازرگـانی بـۆ دەسمالـی قاقەزی.

**کلینیـک** / kilînîk, k(e)lînîk ، ـهـا/: [فرانسـوی] /*سم.* دەرمانگا؛ دەرمانگە؛ دەرمانخانە.

**کلینیکـی** / kilînîkî, k(e)lînîkî/: [فرانسـوی] *صفت.* دەرمانگـایی؛ دەرمانخانـەیی؛ پێوەندیـدار یان سەر بە دەرمانگاوە ‹معالجات کلینیکی: هەتوانی دەرمانگایی›.

**کلیوی** / kolyavî/: [عربـی] *صفت.* گورچیلـەیی؛ گورچەویلەیی؛ گرچکی؛ ولکی؛ پێوەندیدار یـان سەر بە گورچەویلەوە ‹بیماری کلیوی: نەخۆشـینی گورچیلەیی›.

**کلیـە** / kolye ، ـهـا/: [عربـی]/*سـم.* گورچیلـە؛ گورچەویلە؛ گورچەوێڵە؛ گورچیلـک؛ گورچـک؛ گرچک؛ گرچوو؛ گورچوو؛ گورچێ؛ گولچیسـک؛ گولچیلە؛ گوچیلـک؛ گوردالـە؛ گـەرگوو؛ ولـک؛ قـلک؛ خناوکـە؛ دوو ئەنـدامی لووبیائاسـا لـە جەستەی مۆرغەداراندا کە کاری پالاوتنی خوێن و دەلاندنی پێشاو بۆ میزەڵدانە.

**کلیە** / kollîyye/: [عربی] *قید.* هـەموو؛ هـەموان؛ گشت؛ گشـک؛ گـرد ‹کلیـەی حاضران برخاسـتند: هەموو ئامادەبوان هەستان›.

**کـم**[۱] / kam/: *صفت.* کـەم؛ کـێم؛ کـم؛ هنـک؛ هندک؛ هۆندەک؛ هۆندەکە؛ پیچ؛ حـەیب؛ ئـنج؛ جگلە؛ بە چەندیەتیەکی کەمەوە ‹پول کـم: وقت کم: پارەی کەم؛ کاتی هندک›.

▣ **کـم آمـدن**: کـەم هـاتن: ۱. بـە هەنـدی ڕەچاوکراو نەگەیشـتن ‹دیـروز پولها را شـمردم، حالا صد تومان کـم آمـد: دوێنـێ پارەکـانم بـژارد، ئێسـتە سـەد تمـەن کـەم هـاتووە› ۲. هەنـدی پێویست لە دەستدا نەبوون ‹می‌خواستم ماشـین بخرم پول کم آمد: دەمویسـت ماشـین بکـڕم پـارە کەم هات› ۳. *[تعریض]* کەم بوونەوە؛ لە هورمی کەس یان شتێک کەم بوونەوە ‹اگر بە دیـدنش بروی چیزی از تو کم می‌آید؟: ئەگەر بچـی ببیـنی لێت کەم دەبێتەوە؟›.

**کـم آوردن**: کـەم هـاتن؛ کـەم هـاوردن: ۱. کەمایەسی هێنان ‹صد تومان کم آورد: سـەد تمەنی کەم هات› ۲. بڕ نەکردن؛ هـەل، ئـامێر یان توانـایی پێویسـت نـەبوون ‹در مبـارزە کـم آوردن: لە شەڕدا بڕ نەکردن›.

**کم بودن**: کەم بـوون؛ کـەم بیـەی: ۱. بـەس نەبوون؛ بەش نەکردن ‹غذا کم بود سـیر نشـدیم: چێشت کەم بوو تێر نـەبووین› ۲. *[تعـریض]* زۆر بوون ‹خودت کم بودی، یکی دیگر را هـم برداشـتی آوردی؟!: خـۆت کـەم بـووی، یـەکێکی تریشـت هێنا؟!›.

**کـم داشـتن**: کـەم بـوون؛ کـەمی هـەبوون: ۱. هەندی پێویست نەبوون ‹هنوز یـک میلیـون کم داریم: هێشتا میلیۆنێکمان کەمە› ۲. نـەبوون ‹اگر چیزی کـم داشـتی بگـو برایـت بیـاورم: ئەگـەر شتێکت کەم بوو بڵێ بۆتی بێنم›.

**کـم شـدن**: کـەم هـاتن؛ کـەمکـردن: ۱. بـە هەندی پێویست نەگەیشتن ‹غـذامان کـم شـد

همه گرسنه ماندند: چێشتمان کەم هات هەموو برسی مانەوە› ٢. نانە کزی؛ کەوتنە کزی؛ کز بوون؛ کەم بوونەوە ‹آب خیلی کم شده: ئاو زۆری کەم کردووە›.

**کم کردن:** کەمکردنەوە؛ کەمکردن؛ هندکاندن؛ هەلساندن؛ فتکردن ‹دە درصد از حقوقمان کم کردند: دە لە سەدی مووچەمانیان کەم کردەوە›.

**کم کسی یا چیزی نبودن:** کەسێ یان شتێک کەم نەبوون؛ تا ڕادەیەک گرنگ بوون ‹یک میلیون کم پولی نیست: میلیۆنێک پووڵ کەمێک نیە›.

**کم**[2]: *قید.* کەم؛ کێم: ١. بە کەمی؛ لە چەندیەتیەکی چکۆلەدا ‹کم گرفت: کەمی گرت› ٢. بە شێوەی ناتەواو و لەتوکوت ‹کم میدید؛ کم میخوابم: کەمی دەدیت؛ کەم دەنووم›.

**کم-**[3]: *پیشوازه.* کەم-؛ کێم-؛ ـ کەم: ١. بە هەندی کەمەوە ‹کمکار: کەمکار› ٢. بە کارتێکەری کەمەوە ‹کمجان: کەمگیان›.

**کم** / kam(m)/: [عربی]/*اسم.* [ادبی] هەند؛ هێند؛ هند؛ ئەند؛ ئەندازە؛ ئەنازە؛ شۆ؛ ڕادە؛ قاس؛ گۆرە؛ گۆرەبا ‹کم و کیف: هەند و چۆنیەتی›.

**کم** / kom/: *اسم.* کوم؛ ئاڵقەی دەرەکی چەرخ و تەگەر (گاریە، فایتوون،...): **قاسناق**

**کما** / kamā/: *اسم.* ١. [کردی] کەما؛ کەمێ؛ کەمیر؛ هەنگوان؛ بەڕەزە؛ ئالفەگیایەکی خۆرسکی کویستانیە کە لە پالان دەڕوێ، خۆراکی چوارپێیە.

**کما** / komā/: *اسم.* ١. [فرانسوی]/[پزشکی] لەپش؛ لەپژ؛ شۆبە؛ کوما؛ بێهۆشی تەواو کە نەخۆش تەنیا نەفەسی ماوە و هەست بە هیچ شتێک ناکا.

**کماب** / kamāb/: *صفت.* کەماو؛ کەمئاو: ١. بە ئاو یان تراوی کەمەوە ‹خوراک کماب: چێشتی کەماو› ٢. بە سەرچاوکەی ئاوی شیرنی (وەک باران، کانی، ڕووبار و...) کەمەوە ‹سرزمین کماب: مەلبەندی کەماو›.

**کمابی** / kamābî/: *اسم.* کەماوی؛ کەمئاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کەمئاو بوون.

**کمابیش** / kamābîš/: *قید.* کەم تا زۆر؛ کەم تا کورت؛ کەم تا فرە؛ کێم و زێدە؛ دەور و بەر؛ تۆزێ کەمتر یان زۆرتر لە هەندی ڕەچاوکراو یان ناوبراو ‹کمابیش صد هزار تومان خرجشان شد: کەم تا زۆر سەد هەزار تمەنێک خەرجیان تێچوو›.

**کماج** / komāc، ـها/: *اسم.* کۆماج؛ لووەل؛ چەشنێ کولێرەی تورت و ئەستوور کە لە دەفری تایبەت بە خۆیدا (کۆماجدان) دروستی دەکەن.

**کماجدان** / komācdān، ـها/: *اسم.* کۆماجدان؛ جۆرە قاولەمەیەکی گەورەی دەرگادارە کە خۆراک یان کۆماجی تێدا دروست دەکەن.

**کمافی السابق** / kamāfessābeq/: [عربی] *قید.* (هەر) وەک پێشوو؛ وەکوو جاران؛ هەر وەکوو جاران؛ پێسەو جارا؛ هەر بەو جۆرە وا بوو ‹کمافی‌السابق در اداره کار می‌کند: وەکوو پێشوو لە مەزرینگەدا کار دەکا›.

**کماکان** / kamākān/: [عربی] *قید.* هەر وەک هەبوو؛ هەروا؛ هەروەها؛ هەرپاسە ‹سارا کماکان تدریس می‌کند: سارا هەر وەک هەبوو دەرس دەداتەوە›.

**کمال** / kamāl/: [عربی]/*اسم.* کەمال: ١. دۆخ یان چۆنیەتی پێگەیشتن؛ گوران؛ تەواو و بێکەمایەسی بوون ‹انسان در جستجوی کمال است: مرۆ لە دووی پێگەیشتندایە› ٢. ئەوپەڕ؛ باشترین هەندی دروستی و چاکی ‹در کمال سلامت بود: لە ئەوپەڕی ساغیدا بوو› ٣. /ـات/ [گفتاری] ژیری؛ مژیوەری ‹ کمال در این است: ژیری لەوەدایە›.

▣ **کمال مطلوب:** ئارمان؛ کاربەند؛ ئەوی دلخوازە.

**کمالات** / kamālāt/: [عربی]/اسم. لەباری و لەباوی؛ هێژایی و لێهاتوویی.

**کم‌التفات** / kameltefāt/: [عربی] ☜ **کم‌لطف**

**کم‌التفاتی** / kameltefātî/: [عربی] ☜ **کم‌لطفی**

**کمال‌طلبی** / kamāltalabî/: [عربی] ☜ **کمال‌گرایی ـ ٣**

**کمال‌گرایی** / kamālgerāyî/: [عربی/ فارسی] /اسم. ١. ئامۆژەیەک کە کەماڵی کەسایەتی ئەخلاقی مرۆڤ بە باشترین شت دەزانێ ٢. ئامۆژەیەکی کەلامی کە دوورەپەرێزی لە گوناهـ لە سەر زەوی بە شتێکی گونجاو دەزانێ ٣. هۆگرەتی یان تێکۆشان بۆ گەیشتن بە بانترین شۆی کەماڵ: **کمال‌طلبی**

**کمان** / kamān، ـها/:اسم. کەوان؛ کەمان؛ کەڤان؛ کەموو: ١. لبوودی؛ ئامرازێک بۆ تیر هاویشتن، بریتی لە چێو یان کانزایەکی چەماوە کە دوو سەرەکەی بە ژێ توندکراوە ٢. ئامرازی شی‌کردنەوەی ڕیشاڵی خوری و پەمۆ، بریتی لە دارێکی گەورەی سەرچەماوە کە بە پەتێکی ئەستوور بەسراوەتەوە ٣. *[هندسە]* پاژێکی گەورە یان پچووک لە جەغز.

▣ **کمان بازتاب:** *[فیزیولۆژی]* شوێنی بزاوتنی گەڕانێکی دەماری لە ڕەوتی هەڵگەڕانەوەدا.

**کمان رستم:** *[گفتاری]* پرچی ئایشە و فاتمان؛ کۆڵکە زێڕینە.

**کمان‌ابرو** / kamān'abrû/: صفت. *[ادبی]* ئەبرۆکەوان؛ بە برۆی کەوانی و پێکەوە لکاوەوە: **ابروکمان**

**کمان‌اره** / kamānarre, kaman'arre/:اسم. ارەی کمانی ☜ **ارّه**

**کمانچه** / kamānče، ـها/: [کردی]/اسم. کەمانچە؛ کەماچە؛ تاڵ؛ کەمان؛ شاشەک؛ مووزەن؛ میکەش؛ سازێکی ژێدارە بە شێوەی لەتەگۆیەک بە دەستەیەکی باریکەوەکراو و چوارتاڵ سیمەوە کە بە ئارشە دەژندرێ. تایبەتی لوڕستانە و لەویوە هاتۆتە نێو مووسیقای ئێران و دەوروبەرەوە.

**کمانچه‌کش** / kamānčekeš، ـها/:اسم. کەمانچەژەن؛ کەمانژەن؛ کەسێ کە کەماچە دەژەنێ.

**کماندار** / kamāndār، ـها؛ ـان/:اسم. تیرەناز؛ تیرئەناز؛ تیرشان؛ تیرهاوێژ؛ کەسێ کە کاری تیر هاویشتنە، بەتایبەت بە تیر و کەوان.

**کماندان** / komāndān، ـها/: [فرانسوی]/اسم. فەرماندە؛ فەرماندەر؛ سەرکردە؛ سەرپەل.

**کماندو** / komāndo، ـها/: [فرانسوی]/اسم. چریک؛ کوماندۆ؛ گریلا؛ گەریلا؛ سەربازی چالاک و ڕاهاتوو بۆ دابەرزان، شەڕ و داپرسکانی ناکاو.

**کمانک** / kamānak، ـها/:اسم. کەوان؛ کەوانە؛ کەوشە؛ پەڕانتیز: ( ).

**کمانه** / kamāne، ـها/:اسم. ١. ئارشە؛ چێوێکی ڕێک و باریک بە دەستەیەک ڕیشاڵی وەک داموسک لەم سەر و لەو سەریەوە بۆ ژەندنی برێ لە سازە ژێدارەکان ٢. کەوانە؛ کەڤانە؛ کەمانە؛ ئەوی وەکوو کەوان وایە.

▣ **کمانه کردن:** کەوانەکردنەوە؛ کەمانەکردن؛ بازرە کردن؛ تەتەڵە کردن؛ پەرت بوون بە هۆی کوتان بە شتێکدا ‹تیر کمانه کرد و به پایش خورد: تیرەکە کەوانەی کردەوە و دای لە پای›.

**کمانی** / kamānî/: صفت. کەوانی؛ کەمانی؛ کەڤانی؛ چەماوە؛ چەمیوە؛ نووشتاوە ‹ابروی کمانی: برۆی کەوانی›.

**کماهوحقه** / kamāhûhaqqe/: [عربی] قید. *[نامتداول]* وەک شیاوە؛ وەکوو پێویستە؛ بە شێوەیەک کە دەبێ وابێ ‹مزد زحمتش کماهوحقه پرداخت نمی‌شد: مووچەی کارەکەی وەک شیاوە نەدەدرا›.

**کمباین** / kombāyn، ـها/: [انگلیسی]/اسم. کومباین؛ کامپا؛ ماشینی درووێنە، خڕکردنەوە و

کوتانی خەلە.

**کمبزه** / komboze، ـها/: /اسم. خرچە؛ خرچک؛ خرچکە؛ قەرەخرچە؛ عەنجووڕ؛ قریک؛ کوهیزە؛ کاڵەکی کاڵ.

**کمبود** / kambûd، ـها/: /اسم. کەمایەسی؛ کێماتی؛ کەمایەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوون یان کەم بوونی شتێک کە هەبوونی پێویستە ‹کمبود خوراک: کەمایەسی خۆراک›.

**کمپ** / kamp، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ئوردووگا؛ هوردووگا؛ کەمپ.

**کمپانی** / kompānî، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کومپانی؛ بەشدارگە؛ شیرکەتێکی زۆرتر دەرەکی کە چالاکی دروستکردن، خزمەت یان کارێکی ماڵی بەربلاوی هەیە.

**کمپرس** / komp(e)res/: [فرانسوی]/اسم. کار یان ڕەوتی پەستاوتن.

⊡ **کمپرس کردن**: دانانی پارچەی تەڕ (گەرم یان سارد) لە سەر ئەندامی گەزن دیتوو یان بەژان.

**کمپرسور** / komp(e)resor، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پەستێنەر؛ کومپریسور: ١. ئامرازی پەستاوتنی با لە دەفرێکی وەک بەرمیلدا بۆ کەڵکگرتن لە بای بە تەوژم (وەک با کردنە ناو تەگەرە و...) ٢. کەرستەی تایبەت بۆ تێکەڵ کردنی با و سووتەمەنی و فوو کردنە ناو کوورەوە.

**کمپرسی** [1] / komp(e)resî/: [فرانسوی]/اسم. کومپریسی؛ جۆرێ کامیۆن کە جێبارەکەی خۆمەش دەڕواتە سەر و بارەمەی هەڵدەڕژێنێ.

**کمپرسی** [2]: صفت. کومپریسی؛ بە کومپریسورەوە.

**کم‌پشت** / kampošt/: صفت. تەنک؛ شاش؛ کەمپشت؛ بێ پڕیوچڕی.

**کمپلت** [1] / kompelet/: [فرانسوی] صفت. *[گفتاری]* تەواو؛ تواو؛ سەر و بەر؛ تەخت و تواو؛ تەمام؛ بێ کەمایەسی؛ بێ کەمێتی ‹یک دست کمپلت لباس خرید: دەستێک تەواو جلوبەرگی کڕی›.

**کمپلت** [2]: قید. یەکجارەکی؛ یەکجارە؛ یەکسەر؛ یەکڕا؛ پاک؛ تەواو؛ تواو؛ بە تەواوی ‹بولدوزر آوردند و خانه را کمپلت خراب کردند: بولدۆزیریان هێنا و ماڵەکەیان یەکجارەکی تەخت کرد›.

**کمپلکس** [1] / komp(e)leks/: [فرانسوی]/اسم. *[روان‌شناسی]* گرێ؛ گریمانە؛ گرێمانە؛ بیر، داخواز یان بیرەوەریەک کە تەواو یان بەشێکی ژێر پێ بووە و بۆتە گرفتێک لە ژیاندا.

**کمپلکس** [2]: صفت. تێکەڵ؛ لێکدراو.

**کمپوت** / kompût, kompot/: [فرانسوی]/اسم. کومپووت؛ کەمپووتە؛ خۆشاو؛ وەشاو؛ میوەی تۆزێک لە شەربەتدا کوڵاوی سەردەوە بوو.

**کمپوزیسیون** / kompozisyon، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ڕیزبەندی؛ کار و ڕەوتی لە پاڵ یەک چنین بە پێی ڕێژە و پێوەندیگەلی تایبەت، زۆرتر لە ئاسەوارێکی هونەریدا.

**کمپوست** / kompost/: [فرانسوی/ انگلیسی]/اسم. کومپوست؛ کوودی گیایی؛ کوودی بەدیهاتوو لە ماکی گیایی داڕزاو: **کۆمپۆست**

**کم‌پیدا** / kampeydā/: صفت. نەدیار؛ نادیار؛ کەمپەیدا؛ کەمپەیا؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی کەم دەرکەوتنەوە ‹گفتم کم‌پیدایی، گفت مدتی مریض بودم: گوتم نادیاری، گوتی ماوەیەک نەخۆش بووم›.

**کمتر** [1] / kamtar/: صفت. کەمتر؛ کەمتەر؛ کێمتر؛ بە هەند یان چەندیەتی خوارتر لە چاو ئەوانیتر؛ بەرامبەر زۆرتر ‹کار اینجا کمتر است: کاری ئێرە کەمترە›.

**کمتر** [2]: قید. کەمتر؛ کەمتەر؛ کێمتر؛ بە هەڵکەوت؛ جار و بار؛ بە هەند، ڕادە یان ژمارەی خوارتر لە چاو ئەوانیتر ‹کمتر حرف می‌زند: کەمتر قسە دەکا›.

**کمترین** / kamtarîn/: صفت. کەمترین؛ کەمتەرین؛ کێمترین: ١. بە خوارترین هەند، پلە یان بایەخەوە ‹من کمترین نمرەی کلاس شدم:

ئـەمن کـەمترین نمـرەی وانگـە بـووم› ۲. هـیچ؛ یەکجار کەم ‹کمترین حرفی نـزد: هـیچ قسـەیەکی نەکرد› ۳. هەژار؛ فەقیر؛ لەقەمێک کە بێـژەر بـۆ خاکەساری، کاتی قسە کردن بە خۆیـەوە دەنـێ ‹من کمترین می‌خـواهم بـە اطـلاع برسـانم...: ئـەمنی هەژار بە نیازم ڕابگەیەنم...›.

**کمچرب** / kamčarb/ ☜ **کمچربی**

**کـمچربـی** / kamčarbî/: *صفت.* کـەمچـەور؛ کەمچەوری؛ کەمچەربی؛ بـە چـەوری کەمـەوە ‹شیر کمچربی؛ غذای کمچربی: شـیری کـەمچـەوری؛ چێشتی کەمچەوری›: **کمچرب**

**کمچه** / kamče ، ـهـا/: *اسم.* کەمچـە؛ هەسـک؛ هەسکێ؛ ئامێرێکی دەستی چکۆلـە بریـەتی لـە ڕووپەڕێکی سێ‌سووچی کانزایی بە دەستەیەکی بـەرزەوە، بـەنایان بـۆ هەڵـگرتن و پەسـتاوتن و تەخت کردنی قـوڕ و ماسـەوسـیمان بـە کـاری دەبەن.

**کمحافظه** / kamhāfeze ، ـهـا/: [فارسـی/ عربـی] *صفت.* کەمبیر؛ کەم بـیر و هـۆش؛ فەرامۆشـکار؛ ژبیرکەر؛ بە تایبەتمەندی دێـر لەبـەرکردن یـان زوو لە بیر چوونەوە.

**کمحال** / kamhāl ، ـهـا/: [فارسـی/ عربـی] *صفت.* ۱. کەهاڵ؛ تـەوەزەل؛ لـەش‌قـورس؛ بـە لەشـی داهێنراوی کەمجووڵەوە ۲. *[گفتاری]* بـێ گیـان؛ خاو؛ کاڵ؛ بە ماک، مایە، ڕەنگ یـان کـارتێکری کەمەوە ‹قرمز کمحال: سووری بێ گیان›.

**کـمحـرف** / kamharf/: [فارسـی/ عربـی] *صفت.* متن؛ نتم؛ کەمقسە؛ کەمدوو؛ بەرامبەر وڕاج.

**کمحـواس** / kamhavās ، ـهـا/: [فارسـی/ عربـی] *صفت. [گفتاری]* بیربلاو؛ بیرشاش؛ کەمهـۆش؛ بـە تایبەتمەندی پرژ و بلاو بوونی هزر و بیرەوە.

**کمخا** / kamxā/: *اسم. [قدیمی]* کیمخوا؛ کیمخـا؛ کێمخە؛ پارچەیەکی گوڵ-گوڵین و ڕەنگاوڕەنگ بە تۆزێ پرزەوە.

**کمخـونی** / kamxûnî/: *اسم.* کـەمخـوێنی؛ کمخێنی؛ کەمونی؛ نەخۆشینی کەمی خڕۆکەی سووری خوێن و هیموگلوبین.

**کمـد** / komod ، ـهـا/: [فرانسـوی] *اسم.* کومیـد؛ کومـود؛ کـانتۆر؛ دۆلاب؛ دۆلاو؛ دۆلابی؛ یـوک: ۱. جابەئاسایەکی چێوی یان کانزایی بە دەرگـا، قەفەسە و کەشاوەوە بـۆ تێنـانی جـلوبـەرگ و شتومەک ۲. گەنجـە؛ کومیـددیواری؛ جێگـای کومیدئاسای گـەورەی درگـادار لـە دیـواردا بـۆ هەڵگرتنی شت.

**کمـدی** / komedî/: [فرانسـوی] *اسم.* کومیـدی؛ بەرهەمی نومایشی پێکـەنینی یـان حەنـەکاوی ‹فیلم کمدی: فیلمی کومیدی›.

**کمـدین** / komediyan ، ـهـا/: [فرانسـوی] *اسم.* کومیدیەن؛ ئەکتەری کومیدی؛ هونەرمەندێ کە بینەران پێدەکەنێنێ.

**کمر** / kamar/: *اسم.* کەمەر؛ کەمبەر: ۱. ناوقەد؛ ناوقەو؛ ناوقەی؛ نێوقەد؛ ناقەد؛ قـەد؛ سـێوەنگ؛ کەمبەرە؛ سێ‌بەندە؛ میانـە؛ پـش؛ نـەوق؛ نـۆق؛ قەڵ؛ بەشێ لە جەسـتەی مـرۆڤ و چوارپێیـان، نێوان ئاخرین دەندە و زۆپی کەلەکـە ‹کمـرم درد می‌کنـد: کەمـەرم دێشـێ› ۲. تەتەڵـە؛ بەشـێ لـە جـلوبـەرگ کـە کەلەکـە و دەور و بـەری دادەپۆشێ ‹کمر دامن؛ کمر شلوار: کەمـەری دامـەن؛ کەمەری شواڵ› ۳. مل؛ پلـە؛ بەشـی ناوەڕاسـت، بەتایبەت هی ئەو شـتەی کـە ڕاسـت وەسـتاوە ‹کمـر کـوه: کەمـەری کێـو› ٤. گاشـەبەردی سەخلەت و ئاستەم ‹کوه و کمـر: کێـو و کەمـەر› ۵. *ـها/ [گفتاری]* کەمەربەن.

◘ **کمر کوه:** قـەدپاڵ؛ قـەوپاڵ؛ قـەدپار؛ گـەوە؛ بڕدار؛ لاپاڵ؛ لاپا؛ لاپار؛ تیلەشـان؛ نـاو قـەدی کێو.

◘ **کمر به کاری بستن:** *[کنایی]* قـۆڵ لـە کـارێ هەڵکردن؛ قول لە کارێ هەڵماڵین؛ چاکی لێ بە لادا کردن؛ بۆ کارێ وەخۆ کەوتن ‹کمـر بـە قتل او بسته بود: قۆڵی بۆ کوشتنی هەڵماڵیبوو›.

**کمر خم نکردن:** *[کنایی]* نەچەمانەوە؛ کۆڵ نەدان؛ دانەهاتنەوە؛ مل نەدان؛ پایەداری کردن ‹در زیر بار آن‌همه مشکلات کمر خم نکرد: لە ژێر ئەو هەمووە گیر و گرفتە نەچەمایەوە›.

**کمر راست کردن:** *[کنایی]* سەر هەڵێنانەوە؛ پشت ڕاسەو کردن؛ ڕاست بوونەوە ‹وقتی قرضهایش را داد توانست کمر راست کند و دوباره زندگی‌اش روبراه شد: کاتێ قەرزەکانی دایەوە توانی سەر هەڵێنێتەوە و دیسان بووژایەوە›.

**کمر کاری شکستن:** *[مجازی]* پشتی کارێک شکان؛ زۆرتری کارێک ئەنجام بوون ‹ساختمان دارد تمام می‌شود دیگر کمر کار شکسته است: ماڵەکە خەریکە تەواو دەبێت ئیتر پشتی کار شکاوە›.

**کمر کسی را شکستن:** *[کنایی]* پشتی کەسێک شکاندن؛ مازیو یۆی مارتەی؛ کەسێک یەکجار زۆر ئازار دان ‹مرگ پسرش کمر او را شکست: مەرگی کوڕەکەی پشتی شکاند›.

**کمر کسی شکستن:** *[کنایی]* پشتی کەسێک شکان؛ مازیو یۆی مریەی؛ گەزن و ئازاری زۆر دیتن ‹با مرگ پسرش کمر او شکست: بە مەرگی کوڕەکەی پشتی شکا›.

**از کمر افتادن:** *[کنایی]* لە شان و مل/ پەڕ و پۆ کەوتن؛ دژ دامان؛ پرووکیان؛ پرووکیەی؛ زۆر ماندوو بوون، بەتایبەت کەمەر ئێشان ‹تا خانه را جارو کردم پاک از کمر افتادم: تا ماڵەکەم گەسک دا تەواو لە شان و مل کەوتم›.

**بە کمر کسی زدن:** *[کنایی]* لە کەمەری کەسێک دان؛ دان بە ناو قەد کەسێکدا؛ بە کەلەکەی کەسێکدا دان؛ لە بەین بردن و کوشتنی کەسێک ‹الهی جدش بە کمرش بزند: یاخوا جەددی با لە کەمەری›.

**کمربند** / kamarband ، ـها/: *اسم.* کەمەربەند؛ کەمبەرە؛ کەمەربەن؛ کەمەربەنە؛ کەبەند: ۱. پشتێن؛ پشتێند؛ پشتان؛ پشتوێن؛ پشتبێن؛ پژتین؛ پژبێن؛ پشپێنت؛ شاڵ؛ کوژەیا؛ کوژەیش؛ کوژەیە؛ شیتک؛ شووتیک؛ شووتک؛ شوتک؛ شینک؛ بیبن؛ بیبین؛ قەڵبەن؛ قەدبەن؛ قەدبەند؛ مەینە؛ موندی؛ شریتەی لە چەرم، پارچە و... کە بە دەوری ناوقەدیا دەبەستن ۲. ئەوەی کە وەکوو پشتێند دەوری شتێک دەگرێ.

▣ **کمربند اطمینان** ☜ **کمربند ایمنی**

**کمربند امنیتی:** ناوچەیەک کە بۆ هێمنایەتی وڵاتێک پێویستە ئاگاداریەکی تایبەتی لێ بکرێ.

**کمربند ایمنی:** سیرمێ کە سەرێکی بە ماشێنەوە لکاوە و سەرەکەی تری پاش گرتنی سەر سینگ و کەمەری دانیشتوو، بە لای سەندەڵیەوە توند دەبێ: **کمربند اطمینان**

**کمربند سبز:** سەوزەڵانی؛ سەرجەمی باخ و مەزرا و پارک و دار و گوڵی دەوراندەوری کۆمەڵێک ماڵ و شەقام.

**کمربندی** / kamarbandî/: *صفت.* کەمەربەندی؛ کەمەربەنی؛ بە دۆخ و چۆنیەتی دەور دانەوە ‹جادەی کمربندی: ڕێگەی کەمەربەندی›.

**کمرچین** / kamarčîn ، ـها/: *اسم.* کەمەرچین؛ چەشنێ بەرگی زۆرتر ژنانە، کە لە لای کەمەرەوە چینی زۆری هەیە.

**کمردرد** / kamardard/ ☜ **درد**[2]

**کمرشکن**[1] / kamaršekan/: *اسم.* کەمەرشکەن؛ جۆرێ ترەیلی گەورەی تایبەت بۆ بردنی باری زۆر قورس کە لە ناوقەدەوە سووڕ دەخوا.

**کمرشکن**[2]: *صفت.* کەمەرشکێن؛ پشت‌شکێن: ۱. زۆر قورس ۲. *[مجازی]* زۆر دژوار و سەخڵەت.

**کمرکش** / kamarkeš/: *اسم.* لاپاڵ؛ قەد؛ ناوقەد؛ ناقەد؛ نێوقەد؛ کەمەرکەش؛ ناوەڕاست و نیوەی شتێک ‹کمرکش راه: لاپاڵی ڕێگا›.

▣ **کمرکش کوه:** قەدپاڵ؛ قەدپار؛ بەرواڵ؛ بەروار؛ تیلەشان؛ وەندەن؛ بەندەن؛ کەزی؛ کەڤەر؛ کەلوو؛ بروار؛ کاش؛ گەوە؛ لابەلا؛ لاپا؛

لاپار؛ لاپاڵ؛ بەرزاخ؛ گێدۆک؛ ناوقەدی کێو.

**کمرگاه** / kamargāh/: *اسم.* کەلەکە؛ لاکەلاک؛ لاکەلەک؛ کەفاک؛ بەشێ لە جەستە کە کەمەریش بگرێتەوە.

**کم‌رنگ** / kamrang ، ـها/: *صفت.* ۱. کاڵ؛ کالگاو؛ بە ڕەنگی کەم یان ماکی هندکەوە ‹چای کم‌رنگ: چای کاڵ› ۲. بێ‌نموود؛ لاواز؛ کەم و کورت ‹لبخند کم‌رنگ: بزەی بێ‌نموود›.

**کم‌رو** / kamrû ، ـها/: *صفت. [مجازی]* شەرمن؛ شەرمێون؛ شەرمین؛ شەرمۆ؛ شەرمووْ؛ شەرمۆک؛ شەرمی؛ بێڕوو؛ ڕووتەنک؛ کەمڕی؛ کەمڕوو ‹فکر نمی‌کردم این‌قدر کم‌رو باشی: وام نەدەزانی ئەوندە شەرمن بی›.

**کم رویی** / kamrûyî/: *اسم. [مجازی]* شەرمنی؛ شەرمێونی؛ شەرموویی؛ شەرمۆکی؛ بێڕوویی؛ کەمڕوویی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی لێهاتوویی یان لەخۆڕابینی بۆ ئەنجامدانی کاری پێویست و دڵخواز ‹این‌قدر کم‌رویی خوب نیست، برو جلو حرفت را بزن!: ئەوندەش کەمڕوویی باش نیە، بچۆ پێشەوە قسەی خۆت بکە!›.

**کمری** / kamarî/: *صفت.* کەمەری؛ کەمبەری؛ نێوقەدی؛ ناوقەوی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کەمەرەوە ‹اسلحەی کمری: چەکی کەمەری›.

**کم‌غذا** / kamqazā/: [فارسی/ عربی] *صفت.* کەمخۆر؛ کەمخوەر؛ کەموەر؛ کەمەوەرە؛ بە هۆگرەتی و خۆی خواردنی لە ڕادەی ئاسایی کەمتر ‹مادرم خیلی کم‌غذاست، قدر یک بچەی چهارساله غذا می‌خورد: دایکم زۆر کەمخورە، بە قەد منداڵێکی چوارساڵان دەخوا›.

**کم غذائی** / kamqazā'î/: [فارسی/ عربی] ☜ **کم‌غذایی**

**کم‌غذایی** / kamqazāyî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* دۆخ یان چۆنیەتی نەگەیشتنی ماکی خۆراکی بە ئەندازەی پێویست بە لەشی گیانەوەر: **کم‌غذایی**

**کم‌فروش** / kamfurûš ، ـها؛ ـان/: *صفت.* کەمفرۆش؛ ترازووباز؛ بە هۆگرەتی و خۆی فرۆشتنی شت بە شێوەیەک کە لە کێشانە کەمترە ‹بقال سر کوچە خیلی کم‌فروش است: دووکانداری سەرکۆلانەکە زۆر کەمفرۆشە›.

**کم‌فروشی** / kamfurûšî/: *اسم.* کەمفرۆشی؛ ترازووبازی؛ کار و ڕەوتی باریلاخستن؛ فرۆشتنی پیتەوا بە شێوەی کەمتر لە کێشانەی ڕاستی ‹در هر کیلو صد گرم کم‌فروشی می‌کرد: لە هەر کیلۆیەکدا سەد گرەم کەمفرۆشی دەکرد›.

**کم‌فشار** / kamfešār/: *صفت. [شیمی]* کەم‌گوشار؛ کێم‌تەوژم؛ بە گوشاری کەمتر لە ڕادەی سروشتی (بۆ گاز و تراو دەگوترێ).

**کمک**[1] / komak ، ـها/: *اسم.* کۆمەک؛ کومەک؛ کۆمەکی: ۱. یارمەتی؛ یاردەی؛ ئاریکاری؛ فریا؛ هانا؛ ماوش؛ یاریدە؛ هاقل؛ هەڤاری؛ ئاڤیاری؛ یاردم؛ یاریە؛ بازگوڕ؛ هاری؛ ئاری؛ مەیەت؛ مەهەتێ؛ پشتگری دیتران بۆ گەیشتنیان بە مەبەستێک یان پێش چوونی کاریان، بەبێ چاوەڕوانی ‹کمک آزاد نبود موفق نمی‌شدم: یارمەتی ئازاد نەبوایە سەرنەدەکەوتم› ۲. باروبوو؛ باربوو؛ یارمەتی؛ هاریکاری؛ ئاریکاری؛ دەزگیرۆیی؛ دەسگرۆیی؛ شتێ کە بۆ بەجێ‌هاتنی نیازی کەسێک پێی دەدرێ ‹کمک‌های مردم میان سیل‌زدگان تقسیم شد: باربووی خەڵک لە نێوان لافاولێکەوتوواندا بەش کرایەوە› ۳. ئاریکار؛ هاریکار؛ هاوکار؛ بەردەست ‹تنها نبودم دو تا کمک هم داشتم: بە تەنێ نەبووم دوو ئاریکاریشم هەبوون›.

▣ **کمک بلاعوض:** یارمەتی بێ‌باربۆ؛ یارمەتیەک کە بە مەبەستی وەرگرتنی پاداش نەبێ.

**کمکهای اولیه:** کاری دەرمانی یان ئاگا لێ‌بوون لە کاتی ڕوودانی کارەسات و هەر لە جێ و پێش گەیاندنە نەخۆشخانە.

▣ **کمک خواستن:** یارمەتی ویستن؛ یاریدە ویستن؛ هاوکاری گەرەک بوون؛ کۆمەک

خواستن؛ داوای یارمەتی‌کردن؛ بانگ‌کردن لە دیتران بۆ هاوکاری لـە ئەنجامـدانی کارێکـدا ‹از ما کمک خواست، ما هم کمکش کردیم: یارمەتی لێمان ویست، ئێمەش چووینە دەمیەوە›.

**کمک دادن** ☜ **کمک کردن**

**کمک رساندن** ☜ **کمک کردن**

**کمـک کـردن**: یاریـدە دان؛ یارمـەتی دان؛ یاریدەکردن؛ یاری/ یاریە دان؛ چوونە دەمەوە؛ یاری/ ئاریکاری کرن؛ یارمەتی کـردن؛ یـاردە دەی؛ کۆمەگ کردن؛ هلشتن؛ هاوکاری‌کردن لەگەڵ کەسێ بـۆ گەیشـتن بـە مەبەسـتێک: **کمک دادن؛ کمک رساندن**

**کمک ــ**[2]: *پیشـوازە.* ۱. بەردەسـت ـــ ؛ وەردەس ـــ ‹کمک‌آشپز: بەردەست ئاشپەز› ۲. کۆمـەک ـــ ؛ کومەک ـــ ؛ ئـامێری پێکهێنـەر یـان یارمەتیـدەر ‹کمک‌دنده؛ کمک‌فنر: کومەک‌دەندە؛ کومەک‌فەنەر›.

**کم‌کـاری** / kamkārî ، ـهـا/: *اسم.* کـەم‌کـاری: ۱. سەرسڤکی؛ کەم بوونەوەی ئەنقەستی کـار و کاردانەوەی کەس یان ڕێخراوەیەک ۲. *[پزشکی]* کەم بوونی نائاسایی کاری ئەندامێک ‹کم‌کاری غدەی تیروئید: کەم‌کاری لوی تیرۆیید›.

**کمـک‌رسـانی** / komakresānî ، ـهـا/: *اسم.* فریاڕەسـی؛ کـار و ڕەوتی یارمـەتی دان و هاریکاری‌کردن لەگـەڵ کـەس یـان جێگایـەک ‹کمـک‌رسـانی بـە سـیل‌زدگـان: فریاڕەسـی لافاولێکەوتووەکان›.

**کم‌ـ‌کم** / kamkam/: *قید.* وردە ـ وردە؛ کەم‌ـ‌کەم؛ کەم‌کەمە؛ کێم‌ـ‌کێم؛ ڕێزە ـ ڕێـزە؛ چکە ـ چکـە؛ بڕبڕە؛ بڕە ـ بڕە؛ بڕ ـ بڕ؛ تۆزە ـ تۆزە؛ کوچە‌ـ‌کوچە؛ تکوونە ـ تکوونە؛ هێدی ـ هێدی؛ سەبرە ـ سـەبرە؛ هوورک ـ هوورک ‹کم‌ـ‌کم کـار خـراب شـد: وردە ـــ وردە کارەکە تێکچوو›: **کم ـ کَمَک**

**کم ـ کمک** / kamkamak/ ☜ **کَم ـ کَم**

**کمکـی** / komakî ، ـهـا/: *صـفت.* هاریکـار؛ یارمەتیـدەر؛ بـە تایبەتمەنـدی یاریـدەدەری: *الف)* لە ڕێگەی هێز پێدان ‹نیروی کمکی: هێزی هاریکار› ب) لە ڕێگەی وە ئەستۆگرتنی کار یـان کاردانـەوەی دیتـری ‹رانـندەی کمکـی: ئـاژۆوانی یارمەتیدەر›.

**کـم‌لطـف** / kamlotf/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت.* لێ‌نەبان؛ نامیهرەبان؛ بەبێ ئاوڕدانەوە و مێرەوانی و ئاکاری دۆستانە لەمەڕ دیترانەوە ‹مدتی است بـه بنـده کـم‌لطـف شـده‌ایـد: ماوەیەکـە لەمـەڕ منـەوە لێ‌نەبانن›: **کم‌التفات**

**کم‌لطفی** / kamlotfî ، ـها/: [فارسـی/ عربـی]/*اسم.* لێ‌نەبانی؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی ئاوڕ نەدانـەوە و قایل نەبوونەوە: **کم‌التفاطی**

**کم‌محلی** / kam.mahallî ، ـها/: [فارسـی/ عربـی] *اسـم. [گفتـاری]* لالـووتی؛ پشـت‌گوێخـەری؛ پشت‌تێکەری؛ کار و ڕەوتی ئـاوڕ نەدانـەوە یـان گرنگی پێ‌نەدان ‹این کم‌محلی به دوستان چه معنـی دارد؟: ئەم لالووتیە سـەبارەت بـە دۆسـتان چ مانـای تێدایە؟›.

**کمند** / kamand ، ـهـا/: *اسـم.* کەمـەن؛ کەبـەن؛ کەمەند؛ کەبەند؛ کەتوون؛ کەتەن؛ گوریسێ کـە سەرێکی ئالقەیە و لە کێشاندا توند دەبێتەوە، بۆ خستنە مل و دەست و پێی مـرۆ یـان چوارپێ ڕمۆک.

**کم‌وبیش** / kam-o-bîš/: *قید.* کەم تـا زۆر؛ کـەم تا کورت؛ کەم تا فرە؛ کـێم و زێـدە؛ دەور و بـەر ‹زبان انگلیسی را کم و بیش صحبت مـی‌کنـد: زمـانی ئینگلیسی کەم تا زۆر قسە دەکا›.

**کـم‌وزیـاد** / kam-o-ziyād/: [فارسـی/ از عربـی] *صفت.* کەم تا زۆر؛ کەم تا فرە؛ کەم‌وزیاد؛ کـەمتر یان زۆرتر لە هەندی دڵخواز ‹کـم و زیـاد هـزار تـا می‌شود: کەم تا زۆر هەزار دانەیەک دەبێ›.

⊡ **کم‌وزیاد شدن**: دەست تێچـوون؛ بـان‌وخـوار کـردن؛ کـەم‌وزیـاد بیـەی؛ گـۆڕانی هەنـدی شتێک ‹پول‌ها کم و زیاد شده بود: پارەکە دەستی تێچووبوو›. هەروەها: **کم و زیاد کردن**

**کم و کاست** / kam-o-kāst/: اسم. کەم‌وکووڕی؛ کەم‌وکورتی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی کەمتر بوون لە هەندی پێویست یان ڕەچاوکراو ‹ببین چیزی از انبار کم‌وکاست نباشد: بڕوانە شتێکی هومار کەم‌وکووری نەبێ› ۲ کەمایەسی؛ کێماتی؛ کەمایەتی؛ نەبوونی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لە بەردەست نەبوونی هەموو شتانی پێویست ‹اگر کم و کاستی داشتید، بفرمایید تا آماده کنیم: ئەگەر کەم‌وکووریەکتان هەبوو، بفەرموون ئامادەی بکەین› ✱ **کم و کسر**

**کم و کسر** / kam-o-kasr/: [فارسی/ عربی] ☜ **کم‌وکاست**

**کم و کیف** / kamm-o-keyf/: [عربی]/اسم. هەند و چەند؛ چەندیەتی و چۆنیەتی.

**کمون** / komûn, komon/، ـها/: اسم. [فرانسوی] *[جامعه‌شناسی]* کومون؛ کۆمەڵگا یان گرۆیەک کە هەموو ئەندامانی لەوەی کە هەیانە بەشدارن و هی هەموویانە.

▣ **کمون اولیه**: کومونی سەرەتایی؛ کۆمەڵگای مرۆڤی سەرەتایی پێش لە سەردەمی کۆیلەتی.

**کمونیست** / komonîst/: [فرانسوی] صفت. کومونیست: ۱. کومونیستی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کومونیسمەوە ۲ /ـها/ شوێنکەوتووی کومونیسم.

**کمونیستی** / komonîstî/: [فرانسوی] صفت. کومونیستی؛ کومونیست؛ پێوەندیدار یان سەر بە کومونیسمەوە.

**کمونیسم** / komonîsm/: [فرانسوی]/اسم. کومونیسم: ۱. بڕوامەند بەوەی کە هەر کەس تا هەندی توانی کار بکا و بە ئەندازەی پێویست لە پیتەوا و شتانی کۆمەڵگە بەش ببا و کەس خاوەنی هیچ شتێک نەبێ ۲. ئامۆژەیەک کە مارکس، ئینگلس و لینین بۆ گەیشتن بەو مەبەستە پێشنیاریان کرد.

**کمی**[1] / kamî/: [فرانسوی] صفت. کەم؛ کەمێ؛ کەمێک؛ بڕێ؛ بڕێک؛ کەمووکەیەک؛ کێمی؛ هنەکی؛ هندەکی ‹افراد کمی او را می‌شناختند: کەم کەس دەیانناسێ›.

**کمی**[2]: قید. کەمێ؛ کەمێک؛ بڕێ؛ بڕێک؛ بڕێو؛ نەختێ؛ تۆزێ؛ تۆزقاڵێک؛ هەندێ؛ چکێ؛ چکێک؛ کوچێو؛ دالێو؛ نیسکێک؛ بە هەندێکی کەمەوە ‹کمی خوابیدم: کەمێ خەوتم›.

**کمی**[3]: ضمیر. بڕێک؛ هێندێک؛ کەمێک؛ هەندێک؛ کەمێ؛ هەندی کەمتر لە شۆی ئاماژە پێکراوە ‹از میان حاضران کمی آماده‌ی همکاری شدند: لە نێو ئامادەبواندا بڕێک ئامادەی هاوکاری بوون›.

**کمی** / kammî/: [عربی] صفت. چەندی؛ چەندیەتی؛ چەنیەتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە هەند یان ژمارەوە ‹تغییر کمی: گۆڕانکاری چەندیەتی›.

**کمیاب** / kamyāb/: صفت. ناوێزە؛ دەگمەن؛ تووشی کەمی ‹در زمان جنگ برخی کالاها کمیاب بود: لە کاتی شەڕدا بڕێ پیتەوا ناوێزە بوون›.

**کمیابی** / kamyābî/: اسم. کەمایەسی؛ ناوێزەیی؛ دەگمەنی؛ کەمی؛ کەم و کووڕی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی شتێک لە چاو ڕادەی پێویست.

**کمیت** / kam(m)îyyat، ـها/: [عربی]/اسم. چەندێتی؛ چەندایەتی؛ چەندی؛ گورانی: ۱. هەند یان ژمارەی نادیار ‹کمیت x را در نظر بگیرید: چەندێتی x لە بەرچاو بگرن› ۲ هەندی دیاریکراو یان هەڵسەنگێنراو ‹کمیت بزرگ: چەندایەتی گەورە› ۳ ژمارە یان هەندی گشتی ‹تغییر در کمیت موجب تغییر در کیفیت نمی‌شود: گۆڕانکاری چەندێتی نابێتە هۆی گۆڕانی چۆنیەتی› ٤ *[منطق]* ئەو بەشە لە ماک کە بەرانبەری، نابەرامبەری، کەمی و زۆری بۆی دەبێ.

**کمیت** / komeyt/: [عربی]/اسم. کوێت؛ کومەیت؛ قەمەر؛ کەهەر؛ ئەسپی سووری ئاماڵ ڕەش.

⊡ **کمیت کسی لنگ بودن:** /کنایی/ باری کەسێک لار بوون؛ نانی کەسێک بە کۆڵی شێرەوە بوون؛ نانی کەسێک بە ئاوی نەگەیشتن؛ زۆر داماو و بەنیاز بوون ‹مدتی است کُمیتم لنگ است: ماوەیەکە بارم لارە›.

**کمیته** / komîte ، ـها/: [فرانسوی]/سم. شاند؛ لێژنە؛ کومیتە؛ کۆڕێ کە بۆ لێکۆڵینەوە یان ئامادەکردنی گوزارشی کارێک دانراون.

**کمیز** / komîz/: [؟] ☜ **کومیس**

**کمیساریا** / komîsāryā/: [فرانسوی]/سم. کومیساریا؛ مەزرینگە، بنکە یان شوێنی کاری کومیسر ‹کمیساریای عالی پناهندگان: کومیساریای باڵای پەنابەران›.

**کمیسر** / komîser ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی]/سم. /سیاست/ کومیسر؛ بەرپرس؛ لێپرسراوی کارێک ‹کمیسر پناهندگان: کومیسری پەنابەران›.

**کمیسیون** / komîs(i)yon, komesyûn ، ـها/: [فرانسوی]/سم. کومیسیۆن: ۱. تاقمێ لە کەسان کە بۆ ئەرکێکی تایبەت دیاری کراون، بەتایبەت گرۆیەک لە کەسانی ڕێخراوەیەک (وەک وەزاتخانە) ‹کمیسیون رسیدگی به شکایتها: کومیسیونی گەیشتن بە سکاڵا› ۲. دەڵاڵی؛ دەڵاڵیانە؛ پارەیەک کە بە دەڵاڵ بۆ کارەکەی دەدرێ ‹در این معامله دو درصد کمیسیون گرفت: لەم مامەڵەدا دوو لە سەد دەڵاڵی وەرگرت›.

**کمیسیونر** / komîs(i)yoner ، ـها/: [فرانسوی]/سم. نێوانچی؛ نێواچی؛ دەڵاڵ؛ خۆشکەری کڕین و فرۆشتن.

**کمیک** / komîk/: [فرانسوی] صفت. کومیک: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە کومیدیەوە ‹نمایش کمیک: شانۆی کومیک› ۲. گەپچاڕ؛ تیتاڵی؛ پێکەنیندار؛ کەنین‌دار ‹قیافەی کمیک: چاری گەپچاڕ›.

**کمین** / kamîn/: [عربی]/سم. ۱. کوڵ؛ ماتە؛ مەڵاس؛ مەلاز؛ ملاز؛ مکوول؛ کار و ڕەوتی خۆ حەشار دان بۆ هوروژمی لەپڕ و ناکاو ۲. بۆسە؛ بێسوو؛ بووسە؛ بویسە؛ کولە؛ هەشارگە؛ حەشارگە؛ شارگی؛ حەشارگی؛ کەلێن؛ چەپەر؛ خەڵ؛ سپێر؛ پارێز؛ ڕەبەت؛ ڕەوەت؛ ڕوبات؛ مت؛ کولتەنە؛ پاردە؛ کۆزک؛ کاژە؛ کالیت؛ کالیتگا؛ گەهەک؛ گەیگە؛ هەف؛ پەرێز؛ پەسار؛ سیپە؛ مردە و زیندە؛ جێگای ماتەدان یان داو نانەوە ‹چند کمین دشمن شناسایی و تخریب شد: چەند بوسەی دوژمن ناسرا و لە بەین چوو›.

⊡ **کمین کردن:** خۆ داگرتن؛ کەمین گرتن؛ بۆسەگرتن/ خواردن؛ کوڵ گرتن؛ خۆ لە بۆسە نان؛ خۆ لە مەلاس نان؛ خۆ لە پارێز نان؛ خۆ مات‌کردن ‹پشتِ در کمین کرده بود: لە پشتی درگاوە خوی داگرتبوو›.

**کمین کشیدن:** بۆسە دان؛ ماتە دان؛ کولە گرتن؛ لە کەمینگا چاوەڕوان بوون ‹کمین می‌کشیدند تا فرصت لازم را به دست آورند: بوسەیان دەدا تا هەلی باشیان دەس بکەوێ›.

**به کمین کسی/ چیزی نشستن:** بۆ کەس/ شتێک خۆ ماتە دان؛ خۆ بۆ کەسێک ساز کردن؛ خۆ داگرتن لە کەسێ/ شتێ؛ بۆ دەست گەیشتن بە کەس/ شتێک چاوەڕوان و ئاگادار بوون ‹به کمین خان نشسته بودند: بو خان خۆیان ماتە دابوو›.

**در کمین کسی بودن:** کولە/ کوڵ لە کەسێک گرتن؛ بە شوێنی گرتن و هوروژم بردن بۆ کەسێک بوون.

**کمینگاه** / kamîngāh ، ـها/: [عربی/ فارسی]/سم. حەشارگە؛ هەشارگە؛ کەمینگا؛ بۆسە؛ بویسە؛ بووسە؛ بێسوو؛ هەف؛ گەهەک؛ گەیگە؛ پەرێز؛ پارێز؛ بەرەڕەت؛ مردە و زیندە؛ جێگای خۆ ماتە دان بۆ هێرش بردن ‹پشت صخره کمینگاه خوبی بود: پشتی گاشەبەردەکە حەشارگەیەکی باش بوو›.

**مکمن**

**کمینه**[1] / kamîne/: صفت. کەمی کەم؛ کەمترین

ڕاده و هەند.

**کمینه**[۲]: ضمیر. *[قدیمی]* ئەمن؛ ئەزبەنی؛ وشەیەک کە ژنان جار و بارە لە نامەی فەرمیدا بە جێگای «من» بە کاری دەبەن ‹کمینه ناچار بە نگهداری چهار فرزند هستم: ئەمن دەبێ چوار منداڵ بەخێو بکەم›.

**کمینه‌سازی** / kamînesāzî ، ـها/: اسم. *[ریاضی]* کار گەیاندنە کەمترین هەندی شیاو.

**ـ کن** / kan/: *پیوازه.* ـ کەن؛ ـ هەڵکەن؛ ـ هەڵقەن؛ ـ هۆرکەن ‹چاه‌کن؛ کوه‌کن: چاکەن؛ کێوهەڵکەن›.

**ـ کن** / kon/: *پیوازه.* ـ کەر؛ ـ کر ‹سردکن؛ گرمکن: ساردکەر؛ گەرمکەر›.

**کنائی** / kenā'î/: [عربی] ☜ **کنایی**

**کنار**[۱] / kenār ، ـها/: اسم. ۱. قەراخ؛ کەراخ؛ کراخ؛ قراخ؛ ڕەخ؛ ڕۆخ؛ قەراغ؛ قەیار؛ ڤاچ؛ ڕەفی؛ لێوار؛ ئالی؛ لارک؛ کەڤ؛ کەڤی؛ هەلا؛ هەلار؛ کەنار؛ کێلەک؛ لێڤ؛ لا؛ پەڕ؛ دم؛ دوورترین بەشی شتێک لە ناوەڕاستیەوە ‹کنار کاغذ؛ کنار حیاط: لێواری کاغەز؛ قەراخی حەوشە› ۲. باوەش؛ باوش؛ واشی؛ واوشە؛ واوەش؛ کۆش؛ ئامێز؛ هامێز ‹در کنار گرفتن: لە باوەش کردن› ۳. کەڤی؛ کەڤ؛ قەراخ؛ دەم؛ پەڕ؛ وشکانی لێواری دەریا یان ڕووبار.

▣ **از کنار چیزی گذشتن**: *[مجازی]* چاو لە شتێک بەستن/ قووجاندن؛ سەرنج نەدان و نەپەرژان بە شتێک ‹به آسانی نمی‌توان از کنار این مشکل گذشت: هەر وا سووک و هاسان ناکرێ چاو لەم گرفتە ببەستین›.

**کنار**[۲]: *قید.* ۱. پەنا؛ پاڵ؛ لا؛ کن؛ لە نزیکی یان لکاو بە شتێکەوە ‹کنار دیوار: پەنا دیوار› ۲. نزیک؛ نێزیک؛ لە دەرەوە یان لکاو بە شتێکەوە ‹کنار ده: لای گوند›.

▣ **کنار آمدن**: *[مجازی]* سازان؛ سازین؛ ساچان؛ ساز هاتن ‹بالاخره با هم کنار آمدند و معامله سر گرفت: دواخری پێکەوە سازان و مامڵەکە سەری گرت›.

**کنار رفتن**: لاچوون؛ لاچین؛ چوونە کەنار؛ لوایوە لا: ۱. هەلا کەوتن؛ وەلاکەوتن؛ لاکەوتن؛ داپۆشەری شتێک، بە لایەکدا کەوتن و لاچوون ‹پرده کنار رفت: پەردە لاچوو› ۲. لە کار یان پلەیەک چاو پۆشین و بەجێهێشتنی ‹از ریاست کنار رفت: لە سەرۆکایەتی چووە کەنار›: **کنار کشیدن ـ۲**

**کنار زدن**: خستنە لاوە؛ دانە لاوە/ کەنارەوە؛ لادان؛ لاخسن؛ خستنە کەنارەوە؛ دای پاڵ؛ شتێک کێشانە کەنارێکەوە ‹سنگ‌ها را کنار زد: بەردەکانی خستە لاوە›: **کنار کشیدن ـ۱**

**کنار کشیدن**: ۱. ☜ **کنار زدن** ۲. ☜ **کنار رفتن ـ۲**

**کنار گذاشتن**: ۱. خستنە لا/ لاوە؛ پەساردن؛ دانان؛ وستەیوە لا؛ پاشەکەوت خستن ‹پول عروسی را کنار گذاشته بود: پارەی زەماوەندی خستبووە لاوە› ۲. وەلانان؛ لابردن؛ لە درێژە پێدان یان ئەنجامی چالاکیەک بەرگری کردن ‹او را از بازی کنار گذاشتند: لە کایەکە وەلایان نا›.

**کنار گود نشستن**: *[کنایی]* لە دوورەوە ڕوانین؛ لە ماڵ پاڵدانەوە؛ خۆ تێکەڵی کارێک نەکردن ‹تو کنار گود نشسته‌ای و از چیزی خبر نداری: تۆ لە دوورەوە دەڕوانی و ئاگات لە هیچ نیە›.

**کنار** / konār ، ـها/: اسم. تەبگ؛ کونار؛ کەنار؛ کینار؛ تەعەو؛ سیتر؛ سیدرە؛ دارێکی گەرمیانی بە لقی ڕووت، گەڵای چکۆلەی تیژ و ڕەنگی سەوزی تۆخەوە کە میوەیەکی نارنجی و خۆراکی هەیە.

**کنارگذر** / kenārgozar ، ـها/: اسم. لاشانە؛ بوارێکی باریک لە قەراخی شارێگەوە بۆ ڕاگرتنی ماشین یان هاتوچۆی پولیس و ئامبولانس و... لە کاتی ڕێ‌گیراندا.

**کناره** / kenāre ، ـها/: اسم. کەنارە: ۱. زێوار؛ لچ؛ قەراغ؛ قەراخ؛ پەراوێز؛ پەڕاوێز؛ ڕۆخ؛ لێڤ؛

لێڤک؛ لێوار؛ کەف؛ چالاف؛ سنووری هەر شتێک ‹کنارەی دریا: کەنارەی زەلیا› ٢. لاکێش؛ ژێڕاخەر، بەتایبەت فەرشی تەسک بۆ ڕاخستن لە پەنا فەرشێکی ترەوە یان بۆ ڕاڕەوە و... ‹یک کنارەی دستبافت توی راهرو انداخته بود: لاکیشێکی لە ڕاڕەوەکەدا ڕاخستبوو›.

▣ **کنارەگرفتن** ☜ **کنارەگیری**

**کنارەجویی** / kenārecûyî/: *اسم*. دوورەپەرێزی؛ خۆبوێری؛ کار و ڕەوتی تلماسانەوە؛ دووری گرتن لە کەس یان شتێک.

**کنارەگیری** / kenāregîrî/: *اسم*. کەنارەگیری؛ کار یان ڕەوتی دەسبەردان؛ لا بوون؛ کلا بوون ‹آزاد هم از مقامش کنارەگیری کرد و هم از دوستانش: ئازاد هەم لە پلە و پایەی و هەم لە دۆستانی دەستیبەرداوە›.

**کناری**[1] / kenārî/: *صفت*. پاڵدەستی؛ پاڵدەسی؛ کەناری؛ لە لای شتێکەوە ‹نفر کناری: کەسی پاڵدەستی›.

**کناری**[2] / ـها/: ضمیر. پاڵدەستی؛ پاڵدەسی؛ ئەوەی کە لای شتێکەوە بێت ‹کناری مال من است: پاڵدەستیەکە هی منە›.

**کناس** / kannās ، ـان/: [عربی]/*اسم*. قومەشکەن؛ چاهەڵکێش؛ مەوالی؛ کەسێ کە چای ئاوەڕۆ خاڵی دەکاتەوە.

**کنام** / konām ، ـها/: *اسم*. *[ادبی]* لەهن؛ کون؛ کەلما؛ ولە؛ هیلیان؛ شوێنی سەقام گرتنی گیانەوەرانی دڕندە.

**ـکنان** / konān/: *پیوازه*. ١. بە...ەوە؛ لە کاتی ئەنجامدانی کارێکدا ‹خندەکنان؛ گریەکنان: بە پێکەنینەوە؛ بە گریانەوە› ٢. ـ بڕان؛ ـکران؛ ڕێوڕەسمی ئەنجامدانی کارێک ‹عقدکنان: مارەبڕان›.

**کنایات** / kenāyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **کنایه**

**کنایه** / kenāye ، ـها؛ کنایات/: [عربی]/*اسم*. ١. *[ادبی]*. زیپک؛ زیپەک؛ لاتاو؛ نەرێساتی؛ کینایە؛ قسەیەک کە هەر دوو لایەنی ڕواڵەتی و واتای پۆشراوەی تێدایە (وەک ئەوەی بگوترێ «کابرا دەست قووچاوە» واتا: ڕژدە) ٢. تیز؛ تانە؛ زیپک؛ قسەیەک کە نیشانەیێکی لێڵ لە ڕیشخەن و سووکایەتی تێدایە ‹حالا تو هم به ما کنایه می‌زنی؟!: ئێستا تۆش تیزمان تێدەگری؟!›.

**کنایی** / kenāyî/: [عربی] *صفت*. نەرێسات؛ کینایی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کینایەوە ‹معنی کنایی: واتای نەرێسات›: **کنائی**

**کنت** / kont ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم*. کونت؛ لە سەرناوە ئاغەواتیەکانی ئورووپا بۆ پیاوان، بەتایبەت فەڕانسەدا.

**کنتاکت** / kontākt ، ـها/: [فرانسوی/ انگلیسی]/*اسم*. کونتاکت: ١. کلیلی بەرێکردنی بەرق لە ئامرازێکی کارەباییدا ٢. لکاوی؛ لکیاگی ٣. ناتەبایی؛ ئالۆزی (لەمەڕ نێوانی دو یان چەند کەسەوە) ‹آزاد و آرام با هم کنتاکت دارند: ئازاد و ئارام پێکەوە ناتەباییان هەیە› ٤. *[عکاسی]* چاپی وێنە بە شێوەی ڕاستەوخۆ دانانی فیلم لە سەر کاغەزی چاپ.

**کنتاکت‌لنز** / kontāktlenz/: [انگلیسی] ☜ **لنز-٢**

**کنترآلتو** / kont(e)rālto/: [ایتالیایی]/*اسم*. *[موسیقی]* کونتیرئاڵتۆ؛ دەنگی گڕی ژنانە.

**کنترات** / kont(o)rāt ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم*. مەختە؛ قەبەڵ؛ کونتەرات: ١. بڕیاری ئابووری ٢. پەیمانکاری.

▣ **کنترات بستن**: بڕیارنامە نووسین؛ کونتەرات کردن؛ پەیمان بەستن.

**کنترات کردن**: کونتەرات‌گرتن؛ گرتنە کونتەرات؛ مەختەگرتن؛ ئەنجامدانی کارێک بە چەند هەڵومەرجەوە وە ئەستۆگرتن ‹ساختن مدرسه را یک شرکت خارجی کنترات کرده است: بەشدارگەیەکی بیانی کردنەوەی قوتابخانەکەی بە کونتەرات گرتووە›.

**کنتراتچی** / kont(o)rātčî ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ ترکی]/اسم. پەیمانکار؛ کونتەراتچی؛ مەختەچی.

**کنتراتی** / kont(o)rātî/: [فرانسوی] قید. کونتەراتی؛ کونتراتی؛ بە کونتەرات؛ قەبەڵی؛ مەختەیی؛ بە شێوەی پەیمانکاری ‹قرار است خانه را برایمان کنتراتی بسازد: بڕیار وایە ماڵەکەمان کونتەراتی بۆ ساز بکاتەوە›.

**کنتراست** / kontrāst ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کونتراست: ۱. دۆخی کەوتنە لای یەکی ئەندامانی دژ بە یەک (وەک ڕەنگ و مەتن) لە بەرهەمێکی هونەریدا ۲. ڕادەی مەودای نێوان ڕوونترین و تاریکترین بەشی وێنەیەک.

**کنترباس** / kont(e)rbās ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کونترباس؛ سازێکی ڕۆژاواییە لە شێوەی ویۆلون بەڵام یەکجار گەورە، بە چوار یان پێنج تەلەوە، لە زەوی دەنێن و ڕاستی ڕادەگرن و دەیژەنن. دەنگێکی بەرز و گڕی هەیە.

**کنترپوان** / kontrpovān/: [فرانسوی]/اسم. [موسیقی] کونترپوان؛ هونەر یان لێزانی تێکەڵ کردنی چەند دەنگی مووسیقایی جیاواز کە وەک دەنگێک بێتە بەر گوێ.

**کنترل** / kont(o)rol ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کونتروڵ: ۱. دەسەڵات؛ دەستەڵات ‹بیست سال تمام، کشور در کنترل آمریکاییها بود: بیست ساڵی ڕەبەق، وڵات لە ژێر دەسەڵاتی ئامریکاییەکاندا بوو› ۲. هێز و توانای بەڕێوە بردن ‹کنترل کارها با اوست: بەڕێوە بردنی کارەکانی لە ئەستۆدایە› ۳. لێروانین و ڕاگەیشتن بە سەر شتاندا ‹مأموری بلیطها را کنترل می‌کرد: بەرپرسێ بلیتەکانی کونتروڵ دەکرد›. هەروەها: **کنترل داشتن؛ کنترل شدن؛ کنترل کردن**

**کنترلچی** / kont(o)rolčî ، ـها/: [فرانسوی/ ترکی] اسم. [گفتاری] بەرپرسی کونتروڵ.

**کنترلر** / kont(o)roler ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ۱. بەرپرسی کونتروڵ ۲. ئامێری کونتروڵ‌کەر.

**کنتس** / kontes ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کونتیس؛ سەرناوی هاوسەر یان بێوەی کونت.

**کنتور** / kontor ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ژمێرۆک؛ ژمارۆک؛ کونتور؛ ئامرازی شماردنی هەندی گەڕۆک یان هێزی دەکارکراو ‹کنتور آب؛ کنتور گاز: ژمێرۆکی ئاو؛ کونتوری گاز›.

**کنتورنویس** / kontornevîs ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. ژمێرۆک/ ژمارۆک‌نووس؛ کونتورنووس؛ کەسێ کە کاری نووسینی هەندی تۆمارکراوی ژمێرۆکە.

**کنج** / konc ، ـها/:اسم. [گفتاری] سووچ؛ قوژبن؛ کونجک؛ قونجک؛ کونج؛ قونج؛ قولینچک؛ سیلە؛ گۆشە.

◘ **کنج خلوت**: کۆنۆ؛ گۆشەی تەنیایی؛ کونجی چۆڵ؛ جێگایەکی دوور لە چاو و هەبوونی کەسان.

**کنجاله** / koncāle ، ـها/:اسم. تلفارە؛ سڵپی تۆمی گیای ڕۆندار پاش گرتنی ڕۆنەکەی.

**کنجد** / konced ، ـها/:اسم. کونجی؛ کونجە؛ کونجیە؛ شەیدانک؛ کتاف: ۱. گیای یەکساڵە بە دانی چکۆلەی ساف و هێلکەئاساوە ۲. تووی ڕۆنداری خۆراکی ئەو گیایە کە چەند جۆری سپی، ڕەش و سپی، خەنەیی و قاوەیی هەیە.

◘ **کنجد کوهی**: گوڵ بەهەنگ؛ کونجی کەرک؛ کونجی خۆڕسک؛ کونجیەکێویلە.

**کنجدی** / koncedî/: صفت. کونجەیی؛ کونجیتی: ۱. کونجیدار؛ بە کونجیەوە ‹نان کنجدی: نانی کونجەیی› ۲. پێوەندیدار یان سەر بە کونجیەوە ‹استخوان کنجدی: ئێسکی کونجیتی›.

**کنجکاو** / konckāv/: صفت. مڵ‌ومۆکەر؛ مرومووشکەر ‹آزاد خیلی کنجکاو است: ئازاد زۆر مڵ و مۆکەرە›. هەروەها: **کنجکاو بودن؛ کنجکاو شدن؛ کنجکاو کردن**

**کنجکاوی** / konckāvî ، ـها/:اسم. مووشە؛

مڵ‌ومۆ؛ مل و مووش؛ مڕومووش: ١. هۆگرەتی زەینی بۆ زانینی ڕازی دیتران و چۆنیەتی ڕووداوان ‹از روی کنجکاوی سری به آنجا زدم: هەر بۆ مڵ‌ومۆ سەرێکم لەوێ دا› ٢. تێکۆشان بۆ وەها کارێ ‹کنجکاوی کار دستم داد و گیر افتادم: مووشە تووشی کردم و گیر کەوتم›.

**کنجی** / koncî/: *صفت.* سووچی؛ گۆشەیی؛ لە کەنارەوە ‹درِ کنجی: درگای سووچی›.

**کند**[1] / kond ، ـها/: *اسم.* *[قدیمی]* کۆت؛ کۆتە؛ پاوەنە؛ پابەند؛ پالەهەنگ؛ ئامێری ئەشکەنجە بە شێوەی دوو لەتەداری لە دوو سەرەوە کون کە مل، دەست یان پای بەندی یان کوێلەیان تێ دەنا و هەڵیاندەپێکا.

**کند**[2]: *صفت.* کول: ١. کولە؛ کیل؛ نەبڕ؛ کەرخ؛ کال؛ کون؛ کوە ؛ تەقلار؛ کەرۆ؛ کەنی؛ کۆنر؛ بەبێ تیژی و بڕندەیی. بەانبەر: **تیز** ‹چاقوی کند: چەقۆی کول› ٢. هێواش؛ سەور؛ خاو؛ بەبێ خێرایی پێویست. بەرانبەر: **تند** ‹حرکت کند: جوولەی هێواش›. هەروەها: **کند بودن؛ کند شدن؛ کند کردن**

**کند**[3]: *قید.* خاوەخاو؛ خاو؛ هێواش؛ وەسەور؛ گیر؛ بەبێ خێرایی پێویست ‹کند کار می‌کند: خاوەخاو کار دەکات›.

**کندانسور** / kondānsor ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* کوندانسور؛ خەستکەرەوە؛ ئامرازی زۆر کردنەوەی کاردانەوە، تەوژم یان خەستی.

**کندانسه** / kondānse ، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* ١. گوشارده؛ لە ژێر گوشار ٢. هەسە؛ خەستە؛ خەستەوەکراو ‹شیر کندانسه: شیری هەسە›.

**کندذهن** / kondzehn ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* نەگۆمە؛ زەین‌کوێر؛ بەبێ خێرایی شیاو بۆ تێگەیشتن: **کندفهم**

**کندذهنی** / kondzehnî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* نەگۆمەیی؛ زەین‌کوێری؛ دۆخ یان چۆنیەتی دێر تێگەیشتن لە قسە و زانیاری و ڕووداوان.

**کندر** / kondor ، ـها/: [؟] *اسم.* کوندور؛ سیسارگی زۆر گەورەی کۆسارانی ئاند لە ئەمریکای باشووریدا بە پەڕ و باڵی ڕەشی خاڵ سپی و سەر و ملی ڕووتەوە.

**کندفهم** / kondfahm/: [فارسی/ عربی] ☜ **کندذهن**

**کندل** / kondal/ ☜ **اُشک**

**کندن** / kandan/: *مصدر. متعدی.* // **کندی:** کەندت؛ **می کنی:** دەکەنی؛ **بکن:** بکەنە// کەندن؛ کەنن؛ کەنەی؛ قاندن؛ قەندن؛ کەندش؛ کەنتەی؛ کەندەی: ١. هەڵکەندن؛ کەندنەوە؛ جودا/ جیا کردنەوە؛ لێک‌کردنەوە؛ هۆرکەنتەی؛ بەرکێشتەی؛ شتێک بە زۆر و گوشار لە جێگای خۆی دەرهێنان ‹درخت را کندن؛ میوه را کندن: دار هەڵکەندن؛ میوە کەندنەوە› ٢. هەڵکەندن؛ هەڵقەندن؛ هەڵقاندن؛ هەڵکلۆشان؛ هەڵکلۆشین؛ هەڵکولۆشان؛ هەڵکلاشین؛ هەڵکولۆشین؛ هەڵپوچقانن؛ کۆڵین؛ کەنایش؛ کەناین؛ ئەڕفتن؛ فەتاندن؛ ڤەکۆلین؛ هەقاندن؛ دانەوە؛ وەدان؛ لاوەدان؛ جێگایەک کون یان قووڵ کردن ‹چاه کندن؛ زمین را کندن: بیر کەندن ؛ زەوی هەڵکەندن› ٣. داکەندن؛ ئاژنین؛ وەتەی؛ ڤەتش؛ دارنین؛ داڕووتاندن؛ داڕووتانن؛ دەرهێنان؛ لێ‌کەندن؛ لە بەر دەرهاوردنی جل‌وبەرگ ‹پیراهن را کندن: گنج داکەندن› ٤. دابڕین؛ کۆتایی هێنان بە پێوەند یان ڕەوتێک ‹دل کندن: دل کەندن› ٥. هەڵکەندن؛ نوکراندن؛ کەنایش؛ کەناین؛ کەنایا؛ کەنای؛ ڕەوێشتن ‹اسم خود را روی سنگ کندن: ناوی خۆ لە سەر بەرد کەندن› ٦. بژارکردن؛ ئەویە کردن؛ لە بن دەرهێنانی گژ و گیای نەویستی لە مەزرا. هەروەها: **کندنی**

■ **صفت مفعولی: کنده** (کەنراو)/ **مصدر منفی: نکندن** (نەکەندن)

**کندو** / kandû ، ـها/: *اسم.* کەندوو؛ کەنوو؛

کاریتان؛ کوارِ؛ کوارە: ١. کاندوو؛ شەە ؛ گوربـک؛ جێگایەک بۆ ڕاگرتن و بارهێنانی مێشەنگوین ٢. تیرەشان؛ سەرهەنگ؛ شانا زرکێتکیێ؛ پـوورە؛ پلوورە؛ بەرگاز؛ خەڵێف؛ خلێف؛ کاریێ هـەنگان؛ هەنگـەژاڵ؛ هەنگـدان؛ هەنگـەماڵ؛ هەنگـەلان؛ پلوورەمێش؛ کۆچمێش؛ خەلێفـەمێش؛ شـولهە؛ شلـخە؛ کوتیلـە؛ هێلانـەی هـەنگ ٣. کـارک؛ کاندوو؛ کەنوو؛ کەنۆڵە؛ کەوار؛ ئووسرە؛ چەشـنێ سیلۆی چکۆلـەی مالـی بـۆ هەڵـگرتنی ئـارد و دانەوێڵە ٤. *[کنایی]* جێگای پڕ هاتوچوو.

**کندوخانە** / kandûxāne ، ـها/:*اسم.* کەنووخانـە؛ کەندووخانە؛ جێگای ڕاگرتنی پلوورەی هەنگ.

**کندوداری** / kandûdārî ، ـها/:*اسم.* هەنگداری؛ کەندووداری؛ کەنووداری؛ کار و ڕەوتی ڕاگرتن و بارهێنـــانی مێشـــەنگوین و بەرهـــەم هێنـــانی هەنگوین: **زنبورداری**

**کنـد و زنجیـر** / kond-o-zancîr ، ـهـا/:*اسـم.* *[قدیمی]* کۆت و زنجیر؛ کۆتەدار و قفڵ و زنجیر و باقی ئەو شتانەی بۆ بەستنەوەی زیندانی بە کار دەچوو.

**کندوکاو** / kand-o-kāv ، ـها/:*اسم.* کرِ و کـاش؛ کنـە؛ منـیێ؛ بنکۆڵـی؛ بـنگیری؛ کنـەوە؛ کـار و ڕەوتی تۆژینەوە؛ کنەکردن؛ کۆڵینەوە؛ منیێ کرن ‹مـدتی کشـورها را کنـدوکاو کـرد، ولـی چیـزی را کـه می‌خواست نیافت: ماوەیەک کرِ و کاشی وڵاتانی کرد، بەڵام ئەوەی دەیەویسـت نەیدۆزیـەوە›. هـەروەها: **کندوکاو کردن**

**کندە** / konde ، ـها/:*اسم.* کۆتە؛ کۆلک؛ کۆڵـک: ١. کولـکە؛ بـرِیێ؛ کۆتمـە؛ قۆتـەرە؛ هێزنـگ؛ مەجرەف؛ خەرپشـت؛ لەتـە چێـوی ئەسـتوور و کـورت بـە بیچمـی گرۆڤـەرەوە ‹کنـدەی چـوب: کۆلکی چێو› ٢. کۆت؛ کۆتـەدار؛ داری جەزرەبـە دان کـە بـە زنجیـر و ئاڵـقەوە لـە سـەر شـانی دەبەستن ٣. کۆڤڵ؛ کۆتەرەدار؛ کووڵ؛ داریێ کە لقوپۆی سەرەوەیان بریوە ‹کندەی درخت: کۆتـەی دار›.

◙ **کنـدەی زانـو:** کـلاوە؛ زەنگـۆڵ؛ کەشـکۆڵ؛ کەشکەوژنگ؛ زۆپی سەر ئەژنۆ.

**کنـدەکـاری** / kandekārî ، ـها/:*اسم.* کانـە؛ نوکری؛ کەندەکاری: ١. کار و ڕەوتی نوکرانـدن؛ ڕەویشتن؛ کەندنی نەخش و وێنە یان نووسـراوە لە سەر بەرد، دار یان کانزا ‹تمام درها را کندەکاری کردە بودند: تەواوی درگاکانیان کەندەکاری کردبوو› ٢. ئەوەی کە بەم شێوەیە بەدیهاتووە ‹کندەکاری روی سنگ، شیری را در حـال گـرفتن یـک گـاو نشـان می‌داد: کەندەکاری سـەر بەردەکـە، شـێرێکی کـاتی گرتنی گایەک نیشان دەدا›.

**کندی** / kondî/:*اسم.* کـولی؛ کولـی؛ نـەتیژی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەبڕ بوون ‹چاقوی بە این کندی کرە را هـم نمـی‌بـرد: چـەقۆی بـەم کولیـە کـەرەش نابڕیێ›.

**کنس** / kenes ، ـها/: *صفت.[گفتاری]* دەخـس؛ دەخسۆ؛ دەخسۆک؛ چرووک؛ ڕژد؛ دەس‌قووچاو ‹از آن آدم کنس چیزی در نمی‌آید: لەو کـابرا دەخسـە شتێک هەڵناوەریێ›.

**کنسانترە** / konsāntre ، ـهـا/: [فرانسـوی] *صفت.* *[صـنعت]* کونسـانترە: ١. کۆوەبـوو؛ کۆبەسـتوو؛ وێکهـاتوو؛ یەکپارچـە ٢. پرِعـەیار؛ عـەیاربان ٣. خەست؛ هـەس؛ خـەس کـراو ٤. گووشـراوە؛ گووشراو؛ ڕێک‌کوشیو؛ تایبەتمەندی شتێک کـە ئاوی گیراوە. هەروەها: **کنسانترە شدن؛ کنسانترە کردن**

**کنسـرت** / konsert ، ـهـا/: [فرانسـوی]*اسـم.* کونسیرت: ١. بەرنامـەی مووسـیقایی لـە سـەر شـانۆ ‹کنسـرت عزیـز شـاهرخ: کونسیرتـی عـەزیز شارۆخ› ٢. شوێنیێ کە وەهـا بەرنامەیـەکی تێـدا بەڕێوە دەچیێ ‹رفتە بودیم کنسرت: ڕۆیشتبووین بـۆ کونسیرت›.

◙ **کنسرت دادن:** کونسیرت دان؛ بەڕێوە بـردنی کونســـیرت ‹شـجریان در سـلیمانیە کنسـرت داد:

شەجەریان لە سلێمانی کونسێرتی دا›.

**کنسرت داشتن:** کونسێرت هەبوون؛ بەرنامەیێ بۆ بەڕێوە بردنی کونسێرت هەبوون ‹دیشب شوان‌پرور کنسرت داشت، ولی اجرا نشد: دوێشەو شوان‌پەروەر کونسێرتی هەبوو، بەلام بەڕێوە نەچوو›.

**کنسرسیوم** / konsersiyom ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کونسێرسیوم؛ گرۆ یان پێکهاتەیەک لە چەند بەشدارگە، کە زۆرتر بۆ ئەنجامدانی کارێکی گەورەی ئابووری بەدیهاتووە.

**کنسرو** / konserv ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کونسێرڤ؛ کونسێروە: ۱. ماکی خۆراکی کە بۆ بەرگری لە خراپ بوون، لە دەفرێکی بەسراوی بێ‌هەوادایە ‹کنسرو ماهی: کونسێرڤی ماسی› ۲. ئەوەی کە بەم شێوەیە بەستەبەندی کراوە ‹دو تا کنسرو خریدیم: دوو دانە کونسێرڤمان کڕی›.

**کنسرواتوار** / konservātuvār ، ـها/: [فرانسوی] /اسم. یانەی هونەر؛ ڕێخراوەی فێرکاری هونەر، بەتایبەت مووسیقا.

**کنسل** / kansel/: [انگلیسی]/اسم. کار یان ڕەوتی هەڵوەشانەوە؛ شێویانەوە ‹برنامەی سخنرانی کنسل شد: بەرنامەی وتاربێژی هەڵوەشایەوە›. هەروەها: **کنسل شدن؛ کنسل کردن**

**کنسل** / konsol ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ۱. *[معماری]* زۆپی بەشێک لە ماڵ کە بە شێوەی هەیوان، بەرهێوان و پلیکان هاتۆتە پێشەوە ۲. مێز یان سەکۆی بە شێوەی نیوجەغز یان چارەکە جەغزێک لە پەنای دیوار یا سووچی هۆدەدا. * **کنسول-۴**

**کنسول** / konsûl ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ۱. شابەندەر؛ شابەنەر؛ قونسور؛ قونسوور؛ نوێنەری وڵاتێک لە پاتەختەت یان شارێکی وڵاتێکی‌تردا بۆ ڕاگەیشتن بە کاری هاووڵاتانی لەوێ و هەروەها کەسانێ کە دەیانەوێ بڕۆن بۆ وڵاتەکەی ‹کنسول حکومت کردستان در تهران: شابەندەری حوکمەتی کوردستان لە تاران›: **قنسول؛ قنسل؛ قونسول** ۲. هەر یەکە لە دوو خاوەن پلە و پایەی بالای ئیمپراتووری ڕۆم ۳. هەر یەکە لە سێ پلە و پایەی بالای کۆماری فەڕانسە لە سالانی دواى ڕونیسانس (۱۷۹۹-۱۸۰۴)دا ٤. ☜ **کُنسُل**

**کنسولگری** / konsûlgarî ، ـها/: [فرانسوی/فارسی]/اسم. شابەندەری؛ شابەنەرخانە؛ شوێنی کاری قونسوور: **قنسولخانە؛ قنسولگری؛ قونسولخانە؛ قونسولگری**

**کنسولی** / konsûlî/: [فرانسوی] صفت. شابەندەری؛ شابەنەری؛ قونسووری؛ پێوەندیدار یان سەر بە شابەنەرەوە ‹خدمات کنسولی: خزمەتی شابەندەری›.

**کنسی** / kenesî/:/اسم. دەخسی؛ چکووسی؛ ڕژدی؛ دەس‌قووچاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەرچاوتەنگ بوون ‹این‌قدر کنسی نکن، آبرویمان را بردی: ئەوندە دەخسی مەکە، ئابڕووت بردین›.

**کنش** / koneš ، ـها/:/اسم. *[ادبی]* کار؛ کردار؛ ڕەوت ‹هر کنشی موجب واکنشی می‌شود: هەر کارێک هۆی کاردانەوەیەکە›.

**کنشت** / kenešt/: [آرامی]/اسم. ۱. کەنشتە؛ کەنیسە؛ کنیشت؛ پەرستگای جوولەکان ۲. پارلەمانی ئیسراییل.

**کنف** / kanaf/:/اسم. ۱. /ـها/ وش؛ گیاکندر؛ وژەگیا؛ بەرگوالە؛ کەنەف؛ گیایەک بە هەودایەکی زۆر پتەوەوە ۲. کندر؛ کەندر؛ کندرە؛ کندێلە؛ کنر؛ گووش؛ هەودای گیاکندر کە بۆ چنینی تەناف و گۆنی و... کەڵکی لێ‌دەگیرێ ۳. [عربی] *[نامتداول]* پەنا؛ سا؛ دالدە؛ سێبەر؛ سێوەر؛ سەیوەر؛ ساگات؛ سەهەن.

▣ **در کنف حمایت کسی بودن:** لە ژێر سێبەری کەسێکدا بوون؛ لە ژێر چاوەدێری کەسێکدا بوون؛ دە پەنای کەسێکدا بوون.

**کنف** / kenef/: صفت. ۱. هەڵچرچاو؛ گولۆف؛

سیس‌هەڵگەڕاو ٢. ڕووداشکاو؛ لووتشۆڕ؛ شەرمەزار و سووکایەتی پێ‌کراو * **کنفت** *[گفتاری]*. هەروەها: **کنف شدن؛ کنف کردن**

**کنفت** / keneft/ ☜ **کِنِف**

**کنفدراسیون** / konfed(e)rās(î)yon ، ـها/: [فرانسوی]*اسم*. کۆڕێخراوە؛ مەزرینگەیەک کە لە چەند ڕێخراوە دروست بووە.

**کنفرانس** / konf(e)rāns ، ـها/: [فرانسوی]*اسم*. کونفەڕانس: ١. دانیشتن؛ کۆڕی وتاربێژی ٢. وتاربێژی ٣. کۆڕ؛ چاو پێکەوتنی فەرمی بۆ قسە و باس لەمەڕ بابەتێکیی دڵخوازەوە ٤. کۆڕ؛ دانیشتگە؛ شوێنی وەها چاو پێکەوتنێ ٥. وتاربێژی؛ قسەکردنی فەرمی چەند کەس لە ماوەیەکی دیاریکراودا لەمەڕ بابەتێکەوە ٦. کۆڕ؛ جێگای بەڕێوە چوونی وەها وتاردانێک.

◻ **کنفرانس مطبوعاتی:** کۆڕی ڕۆژنامەوانی؛ کۆبوونەوەیەک کە کەسێ (زۆرتر خاوەن دەسەلات) لەگەڵ نووسەران و هەواڵ‌نێران وت‌وویژ دەکا و ئاگاداریگەلێک لەمەڕ خۆی و پرسیارەکانیانەوە دەدات. هەروەها: **کنفرانس خبری**

◻ **کنفرانس تشکیل دادن:** کۆڕ پێکهێنان؛ کۆڕی وتاربێژی دانان.

**کنفرانس دادن:** کونفەڕانس دان؛ لە کۆڕدا وتاردان.

**کنفی** / kanafî/: *صفت*. وشی؛ کندری؛ گیاکندری؛ لە جنسی کندر.

**کنفی** / kenefî/: *اسم. [گفتاری]* لووتشۆڕی؛ شەرمەزاری؛ ڕووداشکاوی.

**کن‌فیکون** / konfayakûn/: [عربی] *صفت*. ژێر و ژوور؛ ژێر و ڕوو؛ خاپوور؛ کلێس ‹دشمن یک روزه شهر را کن‌فیکون کرد: دوژمن بە ڕۆژێک شارەکەی ژێر و ژوور کرد›.

**کنکاش** / kankāš ، ـها/: [مغولی]*اسم*. ١. ڕاوێژ؛ تەکبیر؛ تەگبیر؛ وت‌وویژی نێوان دوو یان چەند کەس بۆ چارەدۆزی ٢. کنە؛ منێ؛ خپر؛ کار و ڕەوتی ڤێکەفتن؛ ڤێکەتن؛ لێکۆڵینەوە؛ تۆژینەوە؛ کۆڵینەوە؛ کۆڵین.

**کنکور** / konkûr ، ـها/: [فرانسوی]*اسم*. کونکوور؛ ئەزموونی هەڵبژاردن؛ ئەزموونێک بۆ هەڵبژاردنی خوازیارانی کار یان خوێندن.

**کنکوری** / konkûrî ، ـها/: [فرانسوی]*اسم*. کونکووری؛ کەسێ کە لە ئەزموونی زانستگا بەشدار دەبێ یان چاوەڕوانی ئاکامی ئەزموونەکەیەتی ‹امسال توی خانه‌مان دو تا کنکوری داریم: ئەوساڵ لەماڵەوە دوو کونکووریمان هەیە›.

**کنگ** / kang/: *اسم. [قدیمی]* پەل؛ باڵی باڵندە.

**کنگر** / kangar ، ـها/: *اسم*. کەنگەر؛ کەنگر؛ کنگر؛ قنگر؛ کەرەنگ؛ کەلەنگ؛ کندر؛ کندرە؛ کەندیل؛ کنر؛ کندێلە؛ قنەر؛ قنگەر؛ کنگەری؛ ستانگ؛ ئەنگینار؛ ئەرتیچۆک؛ بەلکان؛ گیایەکی دڕکاویە لاسک و گەڵا تەرچکەکانی دەخورێ.

◻ **کنگر فرنگی:** کنگەرەفەرەنگی؛ گوڵەکەلەنگ؛ گوڵەکەنگر؛ جۆرێ کەنگری گوڵ زەردی گەڵا دڕکاویە، چووزەکەی دەخورێ و گەڵاکەی تاڵە و تا دەبڕێ.

**کنگر فرنگی وحشی:** ئاڵفەگیایەکی لق‌بەرزی کوڵکنە بە گەڵای درێژووکەی گەورە و گوڵی پەمەیی زۆر جوانەوە: **شُکاعی**

◻ **کنگر خوردن و لنگر انداختن:** *[تعریض]* یاتاقی خستن؛ پەسا داخستن؛ تەختەپۆستی لێ دان بە عەرزا؛ لە جێگایەک بۆ ماوەیەکی زۆر و بەبێ کار و بار مانەوە.

**کنگره** / kongere ، ـها/: *اسم*. قەلبە: ١. کۆنگرە؛ کۆنگەرە؛ کونگیرە؛ ددانەی سەر لێوەی دیوار ٢. هەر پێکهاتەیەک کە بەو بیچمەیە ٣. *[گیاەشناسی]* ددانەی گەورەی نیوەگردی لێوارەی گەڵا.

**کنگره** / kongre ، ـها/: [فرانسوی]*اسم*. کۆڕ؛ کۆنگرە: ١. کۆبوونەوە؛ یەکگرتنەوەی فەرمی

نوێنەران، ناردراوە یان ئەندامانی یەک یان چەند گرۆی ڕامیاری، فەرهەنگی یان زانستی ‹کنگرەی جهانی صلح: کۆڕی جیهانی ئاشتی› ۲. کۆڕگە؛ شوێنی بەڕێوە چوونی وەها کۆبوونەوەیەک ۳. ئەنجومەنی نیشتمانی تاقمێ ولاتان ‹کنگرەی آمریکا: کونگرەی ئامریکا›.

**کنگرەای** / kongere'î/: *صفت.* قەڵبەیی؛ کۆنگەرەیی؛ بە بیچمی قەڵبەوە.

**کنگلومرا** / kong(e)lomerā/: [فرانسوی] ☜ **جوشسَنگ**

**ـ کننده** / konande/: *پیوازە.* ـکەرەوە؛ ـ ڤەکەر؛ ـ وەکەر؛ ـ ئەوەکەر؛ ئەنجامدەری کارێک ‹سرد کننده؛ جداکننده: سارد کەرەوە؛ جیاوەکەر›.

**کنوانسیون** / konvāns(i)yon، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* پێکهاتنامە؛ بڕیارنامەی نێوان چەند ولات ‹کنوانسیون حقوق مؤلف: پێکهاتنامەی مافی نووسەر›.

**کنور** / konûr/: *اسم.* *[قدیمی]* هەورەتریشقە؛ هەورەترێشقە؛ هەورەبرووسکە؛ ئەورترشکی.

**کنون** / kunûn, konûn/: *قید.* *[مخفف، ادبی]* ئێستا؛ ئێستێکە؛ ئیسە؛ ئیسێ؛ ئاییسە؛ نها؛ نۆکە؛ نهۆ؛ نکا؛ نۆکا؛ نووکە؛ هەنووکە؛ هەوکە؛ نوها؛ نوهۆ؛ هینگا؛ دەمانهۆ؛ ئێستە؛ ئێستێ؛ ئەمێستا؛ ئەو ساتەی تێداین.

**کنونی** / kunûnî, konûnî/: *صفت.* *[ادبی]* ئێستا؛ ئێستاکە؛ ئیسەکانێ؛ ئیسە؛ ئێستەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کاتێ کە تێداین ‹دولت کنونی چین: دەوڵەتی ئێستاکەی چین›.

**کنه** / kane، ـها؛ ـگان/: *اسم.* مچ؛ مچی؛ گەنە؛ گاوەک؛ کەوگی؛ کەوەی؛ کەرجە؛ نۆژ؛ کەرزک؛ کەرژە؛ تەنبوو؛ تەبۆ؛ پیتک؛ چنگنە؛ گەنەکەوڵە؛ مێروویەکی چکۆلەیە دەم لە پێستی گیانەوەران دەنێ و خوێنیان دەمژێ.

**کنه** / konh/: [عربی] *اسم.* ناخ؛ پێز؛ ناوەڕۆک؛ بن؛ سەرچاوکە و بنەڕەتی شتێک ‹بە کنه مطلب پی برد: بە ناخی بابەتەکەی زانی›.

**ـ کنی** / kanî/: *پیوازە.* ـ هەڵکەنی؛ ـکەنی؛ ـ هەڵقەنی؛ هەڵکەندن ‹چاەکنی؛ ریشەکنی: بیرهەلکەنی؛ ڕیشەکەنی›.

**ـ کنی** / konî/: *پیوازە.* ـکەری؛ ـکری؛ کردن؛ کارێک ئەنجامدان ‹پنبە پاک کنی؛ چای خشک کنی: پەموو پاککەری؛ چای وشکەوەکەری›.

**کنیاک** / konyāk/: [فرانسوی] *اسم.* کونیاک؛ جۆرێ خواردنەوەی ئەلکولی کە لە شەرابی سپی دروست دەبێ.

**کنیز** / kanîz، ـها؛ ـان/: *اسم.* کەنیز؛ کەنیزە؛ کەنووژ؛ کۆلا؛ ژن یان کچێک کە کۆیلەیە.

**کنیسە** / kanîse، ـها/: [معرب از آرامی] *اسم.* کەنیسە؛ کەنشتە؛ پەرستگای جوولەکان.

**کنیە** / konye، ـها/: [عربی] *اسم.* *[قدیمی]* کەسناو؛ سەرناو؛ ناسناو؛ چەشنێ ناو بۆ کەسان کە زۆرتر لە ناوی دایک و باب یان منداڵانیانەوە گیراوە (وەک: ابن‌سینا؛ ابوالحسن: کوڕی‌سینا؛ باوکی حەسەن).

**کو** / kû/: *قید.* کوا؛ کوانێ؛ کا؛ کۆن؛ کۆنە؛ کۆوەن؛ کوو؛ کوشێ؛ وشەی پرسیار لە جێگای کەس یان شتێک ‹کتاب کو؟: کوا کتێبەکە؟›.

**کوا** / kevā/: *اسم.* کیوا؛ لە زمانگەلی ئافریقایی کە لە لە لیبریاوە تا کونگۆ بە کار دەڕوا.

**کوار** / kovār، ـها/: [؟] *اسم.* کۆوار؛ سەوەتە؛ جۆرە سەبەتێکی گەورە بۆ بار هەڵگرتن کە بە پشتی مرۆڤ یان چوارپێیەوە دەبەستن.

**کوارتت** / kûvārtet، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* *[موسیقی]* کوارتیت؛ ئاهەنگێ کە بۆ چوار ساز یان چوار ستران‌بێژ ڕێک و تەیار کراوە.

**کوارتز** / kuvārtz, kovārtz/: [فرانسوی] *اسم.* بەردەئەستی؛ بریتیە لە ماکی سیلیکا (دووەم ئۆکسیدی سلیکۆن)، بە تۆکمەیی ۷ و قورسی تایبەتی ۲٫٦٥ $gr/cm^3$.

**کوارتزیت**/ kuvārt(e)zît,kovārtzît/: [فرانسوی]

*اسم. [زمین شناسی]* بەردەشووشە؛ بەردئاسایەکی بریقەدارە کە لە پێکەوەلکانی ورکەبەرد و بەردە ئەستێ و سیلیکا بەرهەم هاتووە.

**کوارک** / kovārk، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* کوارک؛ هەرکام لە گەردیلە یەکجار وردەکانی ناخی ئەتوم، وردتر لە ئیلکترۆن.

**کوازار** / kuvāzār/: [فرانسوی] ☜ **اخترنما**

**کواکب** / kavākeb/: [عربی] جمعِ ☜ **کوکب**

**کوالا** / kovālā، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* کوالا؛ گیانەوەری کیسەداری چکۆلەی درەختی، زاگەبەری ئوستراليا، بە پێستی نەرمی خەزدار و خۆلەمێشی و پل و پەنجەی کورتەوە کە گیاخۆرە و بە شەودا دەگەڕێ.

**کوئل** / ko'el/: [از انگلیسی] ☜ **کوئیل**

**ـ کوب** / kûb/: *پیواژە.* ـکوت؛ ـکۆ؛ ـکفت: ۱. ـکووب ‹ گوشتکوب؛ آهنکوب: گۆشتکوت؛ ئاسنکفت › ۲. کوتراو؛ کوتیاو ‹طلاکوب: زێڕکوت›.

**کوبالت** / kobālt/: [فرانسوی] ☜ **کُبالت**

**کوباندن** / kûbāndan/: *مصدر. متعدی.* // **کوباندی:** کوتاتەوە؛ **می‌کوبانی:** دەکوتیەوە؛ **بکوبان:** بکوتەوە// کوتان؛ کوتاندن؛ کوتانن؛ قوتانن؛ قوتان؛ کوەی؛ کوای؛ دان لە کەسێ یان شتێ بە شتێکی‌تر ‹خانەی کلنگی‌اش را کوباند و چند دستگاه آپارتمان ساخت: ماڵە کۆنەکەی کوتا و چەند وارخانی دروست کرد›. هەروەها: **کوباندنی**

■ صفت فاعلی: **کوباننده** (کوتێنەر)/ صفت مفعولی: **کوبانده** (کوتراوە)/ مصدر منفی: **نکوباندن** (نەکوتانەوە)

**کوبنده** / kûbande/: *صفت.* بەقەوەت؛ بەهێز؛ بەگوژمە ‹حملەی کوبنده؛ نطق کوبنده: هێرشی بەقەوەت؛ وتاربێژی بەهێز›.

**کوبول** / kobol/: [انگلیسی]/*اسم.* کوبول؛ لە زمانگەلی بەرنامەنووسی کەمپیوتر.

**کوبە** / kûbe، ـها/: *اسم.* تەقە؛ چەکوچی چکۆلەی هەڵواسراو بە دەرگادا بۆ تەقەدان.

**ـ کوبی** / kûbî/: *پیواژە.* ـکفتی؛ ـکوتی؛ ـکۆیی؛ ـکوتان؛ کوتاندن ‹آهنکوبی؛ گندم‌کوبی: ئاسن‌کفتی؛ گەنم‌کوتان›.

**کوبیدن** / kûbîdan/: *مصدر. متعدی.* //**کوبیدی:** کوتات؛ **می‌کوبی:** دەکوتی؛ **بکوب:** بکوتە// کوتان؛ قوتان؛ کوتاین؛ کوەی؛ کوای؛ کتان: ۱. لێدان؛ مالین؛ مالەی؛ مالتەی؛ کێشان؛ شتێک بە توندی لە شتێکی‌تر دان ‹سرش را کوبید بە دیوار: سەری کوتا بە دیوارەکەدا› ۲. هەڵسااندن؛ نەرمژاندن؛ کوتانەوە؛ کوتاندنەوە؛ کوتاننەوە؛ زەرپانن؛ ئەوەکوەی؛ کوایوە؛ شتێک پەساپەس کوتانەوە و وردکردن ‹برنج کوبیدن؛ خرمن کوبیدن: برنج کوتان؛ خەرمان کوتان›: **کوفتن** ۳. داکوتان؛ شتێک (بەتایبەت بە بەن) بە جێگایەکەوە هەڵواسین ‹عکس را بە دیوار کوبیدن: وێنە کوتان بە دیواردا› ٤. بە توندی ڕەخنەگرتن ‹توی روزنامە وزیر را کوبیده بودند: لە ڕۆژنامەدا وەزیریان کوتابوو› ٥. هەڵپەڕین؛ بە خۆشیەوە هەڵبەز و دابەز کردن ‹دیشب خانەی همسایەمان عروسی بود، تا صبح زدند و کوبیدند: دوێنێ‌شەو ماڵە جیرانەکەمان زەماوەن بوو تا بەیانی لێیان‌دا و هەڵپەڕین› ٦. کاری هاوکرد: ڕێ کردن؛ ڕۆیشتن؛ پێوان؛ ڕێگە برین ‹چهار فرسخ راه کوبیدیم: چوار فەرسەخ ڕێمان بڕی› هەروەها: **کوبیدنی**

■ صفت فاعلی: **کوبنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **کوبیده** (کوتراو)/ مصدر منفی: **نکوبیدن** (نەکوتان)

**کوبیده** / kûbîde/: *اسم.* کباب کوبیده ☜ **کباب**

**کوبیست** / kûbîst، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* کووبیست؛ هۆگر و شوێنکەوتووی کووبیسم.

**کوبیسم** / kûbîsm/: [فرانسوی]/*اسم.* کووبیسم؛ شێوازێ لە هونەری نەقاشی هاوچەرخدا کە هاوکات لە تابلۆیەکدا، چەندبابەتی لێک جیا دێنێتە پێش چاو.

**کوبیک** / kûbîk/: [فرانسوی] *صفت.* کووبیک:

١. چوارپاڵوویی ٢. بە شێوازی کووبیسمەوە (بەتایبەت بۆ بەرهەمی نەقاشی).

**کوپاره** / kûpâre/: *اسم. [قدیمی]* گۆبارە؛ گاگەل؛ گائەل؛ گاگەلە؛ گەلەگا؛ گایەل؛ ڕەوەی گا و گامێش.

**کوپال** / kûpāl، ـها/: *اسم.* ١. *[قدیمی]* کۆپاڵ؛ کووپاڵ؛ کۆپار؛ گۆپار؛ گۆپارە؛ گۆپاڵ؛ گورزی ئاسنی ٢. شان و باهۆی درشت و بە قەوەت.

**کوپرا** / koprā/: [؟] ☜ **کُپرا**

**کوپراتیو** / koprātîv، ـها/: [انگلیسی]*اسم. [نامتداول]* بنکەی هەرەوەزی.

**کوپن** / kupon, kopon، ـها/: [فرانسوی]*اسم.* کوپین؛ کوپون: ١. هەر یەکە لەو قاقەزە چاپیانەی کە لە بار و دۆخێکی تایبەت لە لایەن دەوڵەتێکەوە بۆ دابەشێنی تاقمێ پیتەوا بە خەڵک دەدرێ تا هەر کەس بتوانێ بەو قاقەزانە ئەو پیتەوایە وەربگرێ ٢. هەر یەکە لەو کاغەزانەی کە لە لایەن ڕێخراوە یان مەزرینگەیەکەوە بۆ دانانی خزمەت بە کەسانێکی تایبەت دەدرێ.

**کوپن‌فروشی** / kuponfurûšî, kopon-/: [فرانسوی/ فارسی]*اسم.* کوپین‌فرۆشی؛ کاری کڕینی کوپون لە خاوەنەکەی و فرۆشتنی بە کڕیاران. هەروەها: **کوپن‌فروش**

**کوپنی** / kuponî, koponî/: [فرانسوی] *صفت.* کوپینی: ١. شیاوی دانان و گرتن بە کوپین ‹پنیر کوپنی: پەنیری کوپینی› ٢. *[کنایی]* بە چۆنیەتیەکی ناتەواو و خراپەوە.

**کوپه** / kûpe، ـها/: [روسی]*اسم.* کووپە؛ قەمارە؛ هەر یەکە لە ژوورگەلی تایبەتی مسافر لە قەتاردا.

**کوت** / kût/: *اسم. [گفتاری]* کۆ؛ کوا؛ کۆما؛ کۆگا؛ کۆمەڵێک لە شت یان شتانی جۆراوجۆر کە لە سەر یەک کۆ کراونەتەوە و وەک تەپۆڵکەیەکی لێهاتووە. هەروەها: **کوت شدن؛ کوت کردن**

**کوتاه**[1] / kûtāh/: *صفت.* کورت؛ کوتر؛ کۆتا: ١. نزم؛ نمز؛ کوڵ؛ قوڵ؛ قوڵە؛ قوت؛ کنک؛ کن؛ کند؛ کر؛ کلم؛ بە درێژایی یان بەرزی کەمەوە ‹چوب کوتاه؛ دیوار کوتاه: چێوی کۆتا؛ دیواری نزم› ٢. کەم؛ بە بەردەوامی کاتی کەمەوە ‹مدت کوتاه: ماوەی کورت› ٣. بەبێ بڕ و بەربلاوی ‹قصەی کوتاه؛ خاطرەی کوتاه: چیرۆکی کۆتا؛ بیرەوەری کورت› ٤. بەبێ لێهاتوویی و شیاوی پێویستەوە ‹دست کوتاه؛ فکر کوتاه: دەستی کورت؛ بیری کوتا›.

▣ **کوتاه آمدن**: ١. کورت بوون؛ چکۆلەتر لە هەندی پێویست بوون ٢. *[مجازی]* پاشەکشە کردن؛ دانەواندن؛ دانەوانن؛ کۆتا کردن؛ یەخ بوون؛ یەخ خواردن؛ بە دووی خوازە، مشتومڕ و شەڕدا نەچوون ‹آزاد کوتاه آمد و بحث تمام شد: ئازاد پاشەکشەی کرد و باسەکە بڕایەوە›.

**کوتاه شدن**: ١. کۆتا بوون؛ کوڵ بوونەوە؛ کورت بوونەوە؛ کۆتاوە بیەی؛ کەم بوونەوەی درێژایی شتێک ‹روزها کوتاه شده است: ڕۆژگار کورت بۆتەوە› ٢. *[کنایی]* بڕان؛ لە چالاکی کەوتن ‹دستش از همه جا کوتاه شد: دەستی لە هەموو جێیەک بڕا›.

**کوتاه کردن**: ١. کۆتا کردنەوە؛ کوڵەوکردن؛ کورتکردن؛ کورتەوەکردن؛ قوتکردن؛ کەمەوکردن؛ کورتەوەکردن؛ هیڤشاندن؛ کۆتاوەکەردەی؛ کەم کردنەوە ‹موهایش را کوتاه کرد: مووی کورت کردەوە› ٢. *[مجازی]* بەستن؛ بڕین؛ بڕینەوە؛ لە درێژەی چالاکیەک بەرگری کردن ‹جوابش را چنان داد کە زبانش را کوتاه کرد؛ پای آرام را از آنجا کوتاه کرد: وەهای وەرام داوە زمانی بەست؛ پای ئارامی لەوێ بڕی›.

**کوتاه**[2]: *پیشوانژه.* کۆتا ـ ؛ کورتە ـ ؛ ـکورت؛ کوڵە ـ ؛ قوڵە ـ ؛ بەبێ چەندیەتی یان چۆنیەتی شیاوەوە ‹کوتاەقد؛ کوتاەفکر: کورتەباڵا؛ بیر کورت›.

**کوتاه‌بین** / kûtāhbîn/ ☜ **کوتەبین**

**کوتاه‌دست** / kûtāhdast، ـان/: *صفت. [مجازی]*

دەسکورت؛ دەستەنگ؛ بەبێ توانایی (بەتایبەت مالی) پێویست. هەروەها: **کوتاەدستی**

**کوتاەفکر** / kûtāhfekr ، ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت. [مجازی]* بیرکورت؛ بەبێ توانایی زەینی بۆ هەڵسەنگاندنی دیاردەگەل و تێگەیشتن لە ڕووداوان: **کوتەفکر** *[ادبی]*. هەروەها: **کوتاەفکری**

**کوتاەقامت** / kûtāhqāmat/: [فارسی/ عربی] ☜ **کوتاەقد**

**کوتاەقد** / kûtāhqad/: [فارسی/ عربی] *صفت.* کورتەبالا؛ بالاکۆتا؛ بەژن‌کورت؛ بالابووچک؛ کورتەلە؛ حەپلەحورچ؛ کلمۆ؛ کورتیلە؛ زۆرقە؛ خرپنە؛ گەن؛ گنلە؛ گرکێ؛ کورتەبنە؛ خرپلە؛ خرپلانە؛ مێقلانە؛ بەژن‌هووت؛ قولەبنە؛ کورتیلانە؛ بە بالای کەمتر لە هەندی ئاسایی: **کوتاەقامت**

**کوتاەمدت** / kûtāhmoddat/: [فارسی/ عربی] *صفت.* کەم‌ماوە؛ کورت‌ماوە؛ کورتەماوە؛ بە درێژایی کاتی کەمەوە. بەرانبەر: **بلندمدت؛ درازمدت** ‹سفر کوتاەمدت: سەفەری کەم‌ماوە›.

**کوتاهی** / kûtāhî/: *اسم.* کۆتایی؛ کووتای: ١. کولی؛ کورتی؛ کۆتاهی؛ قولی؛ کنکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کورت بوون ‹کوتاهی پردە چارە دارد: کورتی پەردە چاری دێ› ٢. *[مجازی]* کەمتەرخەمی؛ کەترەخەمی؛ دۆخ یان چۆنیەتی باش ورد نەبوونەوە لە ئەنجامدانی کارێک ‹کوتاهی در مراقبت از بچەها: کەمتەرخەمی لە ئاگاداری مندالان›. هەروەها: **کوتاهی کردن**

**کوتولگی** / kutûlegî/: *اسم.* باواقۆرەتی؛ بستەبالایی؛ چلەنۆکی؛ قەزمی؛ گزگلی؛ کولەبنەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی دووگوردی.

**کوتوله**[1] / kûtûle ، ـها/: *اسم.* باواقۆرەت؛ باوەقۆرەت؛ باوەقوورەت؛ باوەقۆت؛ بستەبالا؛ چلەنۆک؛ بالابۆست؛ موولە؛ گوبخوڤر؛ کابهوور؛ کنک؛ بالافس؛ گزگل؛ گونەگیسک؛ نیوبست؛ کوندەفسک؛ کوندلفس؛ کۆتالە؛ چلەنۆک؛ قەزم؛ سمەخرتە؛ کورتیلە؛ بنەمۆم؛ دووگوردی؛ بابەعەمرە؛ باواعەمرە؛ باوەعەمرە؛ گیانەوەرێ کە لە گەشەی ئاسایی بەجێ ماوە، بەتایبەت مرۆڤێک کە بالای زۆر لە هەندی ئاسایی کورت‌ترە.

⊡ **کوتولەی سفید:** ستارەی کوتولە ☜ **ستارە**

**کوتوله**[2]: *صفت.* بستەبالا؛ چلەنۆک؛ بالابۆست؛ موولە؛ گونەڵ؛ خرپنە؛ خیپشە؛ بەژن‌کورت؛ گونجوڤر؛ کابهوور؛ کنک؛ بالافس؛ گزگل؛ گونەگیسک؛ نیوبست؛ کوندەفسک؛ کوندلفس؛ کۆتالە؛ قەزم؛ باواقۆرەت؛ دووگوردی؛ زۆر کورتەبالا ‹مرد کوتولە: پیاوی بستەبالا›.

**کوتە** / kûtah/: *صفت. [مخفف]* کۆتا؛ کورت؛ کن.

**کوتەبین** / kûtahbîn ، ـان/: *صفت. [مجازی]* بیرکورت؛ بەبێ توانایی پێویست لە هەڵسەنگاندنی دروستی کار و تێگەیشتن لە ڕووداوان: **کوتاەبین**

**کوتەفکر** / kûtahfer/: [فارسی/ عربی] ☜ **کوتاەفکر**

**کوتەنوشت** / kûtahnevešt/: *اسم.* کورتەناو؛ ناوێ کە لە کورت‌کردنەوەی چەند نێو یان وشە دروست بووە.

**کوچ** / kûč/: [ترکی] *اسم.* کۆچ؛ کووچ: ١. بار؛ باربار؛ کار و ڕەوتی لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی‌تر چوون و بۆ ماوەیەک نیشتەجێ بوون ‹کوچ ایل قشقایی: کۆچی خێلی قەشقایی› ٢. گرۆیەک کە لە کاتی کۆچ‌کردنداندان ‹شاهد حرکت کوچ بودیم: چاومان لە ڕۆیشتنی کۆچ بوو›.

⊡ **کوچ دادن:** ڤەکۆچاندن؛ کۆچاندن؛ کۆچ پێ‌کردن؛ بار پێ کردن؛ ماڵەوماڵ پێکردن.

**کوچ کردن:** کۆچین؛ کۆچ‌کردن؛ بارگە تێکەوە پێچان؛ بارکردن/ کەردەی؛ کۆچ لێنان؛ وەنایش.

**کوچاندن** / kûčāndan/: [ترکی/ فارسی] *مصدر. متعدی.* // **کوچاندی:** کۆچاندت؛ **میکوچانی:**

دەکـۆچێنی؛ **بکوچـــان:** بکۆچێنـــە// کۆچانـــدن؛ ڤەکۆچاندن؛ کۆچ پێ کـردن؛ بـار پەنەکـەردەی؛ گۆزاندنەوە؛ کەس یان گرۆیەک (زیاتر بە زۆر) بـۆ جێگایەکی تر نـاردن و لـەوێ نیشـتەجێ کـردن ‹کوچاندن طایفه‌ای از مردم کرد به قوچان: کۆچاندنـی تیرەیـەک لـە کـوردان بـۆ قووچـان›: **کوچانیـدن**. هەروەها: **کوچاندنی**

■ صـفت فـاعلی: **کوچاننـده** (ــ)/ صـفت مفعـولی: **کوچانـده** (کـۆچێنراو)/ مصـدر منفـی: **نکوچانـدن** (نەکۆچاندن)

**کوچانیدن** / kûčānîdan/: [ترکـی/ فارسـی] ☜ **کوچاندن**

**کوچک** / kûčak, kûček ، ـها/: *صفت.* چکۆلـە؛ چکۆلـە؛ چکوولـە؛ بچکـۆک؛ بیچـگ؛ بچـووک؛ پچووک؛ بووچـک؛ بویچـک؛ بچـۆک؛ بووچکـە؛ بچویـک؛ بچووچـک؛ فنجـگ؛ چکـۆڵ؛ چکەلـە؛ چکەلە؛ کوچکۆک؛ بیچکەلە؛ چـووک؛ چووکـە؛ کچک؛ کچکە؛ گچک؛ گچکە؛ گچکـۆ؛ گوچـک؛ بچۆلە؛ قومـە؛ کولـوو؛ گـۆجێرە: ۱. گولالـە؛ بـە بارستایی کەمەوە ‹ظرف کوچک: دەفـری چکۆلـە› ۲. گولالـە؛ لـە ڕادەی هندکـدا ‹حیـاط کوچـک: حەوشـەی بچـووک› ۳. بـە هەنـدی کەمـەوە ‹سرمایەی کوچک: سەرمایەی چکۆلە› ٤. بێ‌بایەخ؛ کەم‌هورم ‹با رفتن پیش این و آن خـودت را کوچـک نکن: بە ڕۆیشتن بۆ لای ئـەم و ئـەو خـۆت پچـووک مەکەوە› ٥. *[گفتاری]* گولالە؛ وردی؛ کەم‌تەمـەن؛ مێرمنداڵ ‹بزرگ و کوچک همه آنجا بودند: گـەورە و چکۆلـە هـەموو لـەوێ بـوون› ٦. ژێردەسـتە؛ ژێردەس؛ خـواردەس ‹او همیشـه مـی‌گوید: «مـن کوچـک شـما هسـتم»: ئـەو هەمیشـە ئـەیژێ: «مـن بووچکتانم»›. هەروەها: **کوچـک بـودن؛ کوچـک شدن؛ کوچک شمردن؛ کوچک کردن**

**کـوچکی** / kûčakî, kûčekî/: *اسم.* چکۆلـەیی؛ بچـووکی؛ بـووچکی؛ گولالـەیی: ۱. دۆخ یـان چۆنیەتی بچکۆلە بوون ‹توی اتاق بـە ایـن کـوچکی چطور جا می‌گیریـد؟: لەم ژووره هێنده چکۆلەدا چۆن جێتـان دەبێتـەوە؟› ۲. منداڵـی ‹او را از کـوچکی می‌شناختم: هەر لە منداڵیەوە دەمناسی›.

**کوچندگی** / kûčandegî/: [ترکی/ فارسی]/*اسم.* *[جامعه‌شناسی]* کۆچەرایـەتی؛ چەشـنێ لـە ژیـانی کۆمەڵایەتی کە کەسـانی کۆمەڵـگا بـۆ دابـینی داخوازی ژیان و پێویستەکانیان، جـار لـە دووی جـار لـە جێگایێکـەوە بـۆ جێگایـەکی تـر کـۆچ دەکەن. بەرانبەر: **اسکان‌یافتگی**

**کوچنده** / kûčande ، ـها؛ ـگان/: [ترکـی/ فارسـی] *صفت.* کۆچەر؛ گەڕۆک؛ ڕەوەند؛ خێڵەکی؛ بە خۆ و هۆگرەتی کۆچ کردن. بەرانبەر: **اسـکان‌یافتـە** ‹ایلهای کوچنده: خێلانی کۆچەر›.

**کوچ‌نشین** / kûčnešîn ، ـها؛ ـان/: [ترکی/ فارسی] /*اسـم.* ۱. ڕەوەن؛ ڕەوەنـد؛ زەوەنـد؛ کۆچـەر؛ هەوارچی؛ خێڵەکی؛ خێلاتی؛ گەڕۆک؛ کەسێک کە لە جێگایەکەوە (شار یان وڵاتێ) دەچـێ و لـە جێگایەکی‌تر نیشتەجێ دەبێ ۲. جێگایەک کـە گرۆیەکی تێ‌هـاتووە و لـەوێ نیشـتەجێ بـوون ۳. چادرنشین؛ چایرنشین؛ کۆن‌نشین؛ گـەرمێن و کوێسـتان‌کـەر؛ چـۆڵ‌پەرسـت؛ چـۆڵ‌نشـین؛ هەواری؛ هەوارێ؛ هۆبەیی؛ هۆبەیێ؛ هۆبەنشین؛ ڕەشماڵ‌نشین؛ خاوەن ژیانی کۆچەرایەتی.

**کوچ نشینی** / kûčnešînî/: [ترکـی/ فارسـی]/*اسم.* کۆچەرایـەتی؛ چادرنشـینی؛ کۆچـەری؛ کـار و ڕەوتی نیشتەجێ بوون لە خێوەتدا بۆ تێدا ژیان.

**کوچولو** / kûčûlû/: *صفت.* *[گفتـاری]* چکۆلانـە؛ بچکۆلانە؛ بچکۆل؛ پچکۆل؛ پچکولە؛ پچکەلانـە؛ پچکۆلانە؛ پچکەلە؛ کوچـوچ؛ قچـک؛ بچکـۆک؛ چکۆلووکە؛ بیچکەلانـە؛ بووچکـەڵ؛ بووچکەلـە؛ بووچکەلانـــە؛ بووچکـــەل؛ بچکەلـــە؛ بووچـــان؛ بووچانـــێ؛ گچکەلـــە؛ گچکۆلـــە؛ بچکەلانـــە؛ بیجکەلۆکە؛ وردی؛ وردیلە؛ گولالە: ۱. بچـووک؛ خۆچوک؛ گچکە؛ بـە بارسـتایی کەمـەوە ‹سیب کوچولو؛ ماشـین کوچولـو: سـێوی چکۆلانـە؛ ماشـینی

بچکۆلانە› ٢. ‌/ـها/ کەمساڵ؛ کەم تەمەن؛ منداڵ‌کار؛ مێرمناڵ؛ مێردمنداڵ؛ خاوەن تەمەنی کەم ‹بچەی کوچولو: منداڵی بچکۆل›.

**کوچه** / kûče/:/اسم. کۆڵان؛ کۆران؛ کووچە؛ کووچی؛ کووجی؛ کووجیە؛ ناو کەلان؛ کووە؛ کیچە؛ لەین؛ کاپان: ١. ‌/ـها/ ڕێگای (زۆرتر) تەسک لە نێوان دوو ڕیز خانوودا ٢. *[مجازی]* دەرەوەی ماڵ.

▣ **کوچەی آشتی کنان:** *[کنایی]* ئالولە؛ دەربوونە؛ کۆڵانی تەنگەبەر.

▣ **کوچه دادن:** ڕێ‌کردنەوە؛ ڕێ دان؛ بەرایی دان؛ درن دای؛ دردان؛ لاچوون و ڕێ باز کردن بۆ تێپەڕینی کەسێک ‹مردم کوچه دادند تا پهلوان وارد حیاط شد: خەڵکی ڕێیان کردەوە تا پاڵەوان چووە ناو حەوشەوە›.

**خود را به کوچەی علی چپ زدن** ☜ **خود**[1]

**کوچەباغ** / kûčebāq ، ـها/:اسم. کۆڵان یان بوارگەیەک کە هەر دوو لای باخە.

**کوچەباغی** / kûčebāqî/ ☜ آواز کوچەباغی، **آواز**

**کوچەبند** / kûčeband ، ـها/:اسم. مێڵە، پایە یان زنجیرێک کە بۆ بەستنی ڕێگەی ماشین، لە سەر کۆڵانی دادەمەزرێنن.

**کوچیدن** / kûčîdan/: [ترکی/ فارسی] مصدر. لازم. // **کوچیدی:** کۆچای؛ **می کوچی:** دەکۆچی؛ **بکوچ:** بکۆچە// کۆچان؛ کۆچین؛ کۆچ کردن؛ گۆزانەوە؛ وەنایش؛ جێگای نیشتەجێ بوونی خۆ گۆڕان ‹از سقز کوچیدند و رفتند کرمانشاه: لە سەقز کۆچیان کرد و چوونە کرماشان›. هەروەها: **کوچیدنی**

■ صفت فاعلی: **کوچنده** (کۆچەر)/ صفت مفعولی: **کوچیده** (کۆچاو)/ مصدر منفی: **نکوچیدن** (نەکۆچان)

**کوخ** / kûx ، ـها/:اسم. *[ادبی]* کاز؛ کولیت؛ قولیت؛ کۆخ؛ قۆخ؛ کۆختە؛ قۆختە؛ قولخ؛ کۆزلاخ؛ کۆخک؛ کەوێل؛ هۆلک؛ مالک؛ کێڵ؛ خنجک؛ چاتۆل؛ خانووچکەی یەک چاوە لە دەشت یان باخدا: **کومه**

**کوخ‌نشین** / kûxnešîn ، ـان/: صفت. *[ادبی]* کازنشین؛ کۆخ‌نشین؛ کۆختەنشین؛ هۆلک‌نیش؛ نیشتەجێی ماڵۆچکە.

**کود** / kûd ، ـها/:اسم. کوود؛ کووت؛ هەر یەکە لە ماکگەلی سروشتی یان کیمیایی کە بۆ بەهێز کردنی گەشەی گیا بە شێوەی دەسکرد لە خاکی دەکەن.

▣ **کود حیوانی:** گویبڕی؛ گوێبڕە؛ پەیین؛ ماکی ئالی، بەتایبەت شیاکە، کە وەک کوود بە کاری دەبەن.

**کود سبز:** کووتی گیایی؛ گیایەک کە دەیکێڵن و کاتی گوڵ‌کردنی لە ژێر خاکی دەخەن تا ببێتە هۆی بەهێز بوونەوەی خاک.

**کود شیمیایی:** کووتی کیمیاوی؛ کوودی بەرهەمهاتوو لە چەند ماکی کیمیایی (وەک نیتراتی سودیوم یان پوتاسیوم، نیترات و سوولفاتی ئامونیوم و...) بۆ بەقەوەت‌کردنی خاک.

**کودئین** / kode'în/: [فرانسوی] ☜ **کُدئین**

**کودتا** / kûdetā ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کوودەتا؛ کوودتا؛ کاری پەنامەکی و هاوڕێ لەگەڵ کەین و بەینی گرۆیەک لە هێزی چەکداری بۆ گرتنەدەستی حکوومەت. هەروەها: **کودتا شدن؛ کودتا کردن**

**کودتاچی** / kûdetāčî ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ ترکی] صفت. کوودەتاچی؛ خاوەن پلەی ڕێبەرایەتی یان هاوقۆڵی لە کوودتادا.

**کودرست** / kûdrost/ ☜ **گندروی**

**کودری** / kudarî/: [؟] ☜ **کُدَری**

**کودک** / kûdak ، ـان/:اسم. *[ادبی]* منداڵ؛ مناڵ؛ مندار؛ مناڵ؛ زارۆ؛ زاورۆ؛ زارۆک؛ زارووک؛ جینۆک؛ زار؛ زاروو؛ زاڕوو؛ زاری؛ زارۆڵە؛ زاڕۆڵە؛ زاوڵە؛ بەچە؛ بێچووی مرۆڤ تا بەر لە

پێگەیشتن، بەتایبەت لە سێ ساڵانەوە تا سێزدە ساڵان.

⊡ **کودک استثنایی:** منداڵێ کە بە هۆش و زەیندا لەگەڵ منداڵانی‌تر جیاوازی هەیە، بەتایبەت منداڵێ کە تەواو نیە.

**کودک زودرس:** منداڵی بزیو؛ منالێ کە لە چاو هاوتەمەنانی گەشەی زەینی سەرە.

**کودک عقب‌مانده:** منداڵی دواکەوتوو؛ منداڵێ کە توانایی زەینی و هۆشی کەمە.

**کودکآزاری** / kûdakāzārî/: *اسم.* منداڵئازاری؛ کارەڕەهاتی ئازاندن و ئەشکەنجە کردنی منداڵان.

**کودکانه**[1] / kûdakāne/: *صفت.* مناڵانە؛ منداڵانە؛ مندارانە؛ زاوڵانە: ۱. وەکوو زارۆکان ‹چهرەی کودکانه: چاری منداڵانه› ۲. *[کنایی]* کاڵ؛ نەپوخت؛ بەبێ وردکردنەوە و تێڕامان ‹حرفهای کودکانه: قسەی منداڵانه›.

**کودکانه**[2]: *قید.* منداڵانە؛ مناڵانە؛ بە شێوەی منداڵان ‹کودکانه رفتار کردن: مناڵانه جووڵانەوە›.

**کودکستان** / kûdakestān ، ـها/: *اسم.* باخچەی منداڵان؛ دامەزراوەیەک بۆ ئاگا لێبوون و ڕاهێنانی منداڵانی ۳ تا ۵ ساڵان لە چەن کاتژمێری ڕۆژدا.

**کودکی** / kûdakî/: *اسم.* منداڵی؛ منالی؛ منداری؛ زارۆکی؛ زاڕۆڵەیی؛ زاوڵەیێ؛ کاتی منداڵ بوون ‹در کودکی چند بار بیمار شد: له منداڵیدا چەن جار نەخۆش کەوت›.

**کودکیار** / kûdakyār ، ـان/: *اسم.* دایەن؛ پەرستارێ کە لە باری ئاگاداری‌کردن و فێر کردنی زارۆکاندا شارەزایە.

**کودکیاری** / kûdakyārî/: *اسم.* ۱. بنەما و شێوەی زانستی ئاگاداری‌کردن لە منداڵان، بەتایبەت لە نەخۆشخانە، دایەنگە و باخچەی منداڵان ۲. پیشەی ئەو کەسەی کە وەها کارێک دەکات.

**کودگل** / kûdgel/: *اسم.* قوڕەڕەشە؛ هەڕگەڕەشە؛ قوڕ و چلپاوێ کە لە پاشماوەی گیانەوەر و گیای وردیلەی ئاوی دروست بووە و ماکی قیری لێ بەرهەم دێ.

**کودن** / kowdan, ko:dan ، ـها/: [عربی] *صفت.* سەرکوێر؛ سەربەتاڵ؛ زەین‌کوێر؛ بێهۆش؛ سەروشک؛ هش‌سڤک؛ ئاقڵ‌سووک؛ لپاش؛ شاوێر؛ شاڤێر؛ خەپلە؛ تێنەگەیشتوو؛ لۆقلۆق؛ دەبەنگ: ۱. بەبێ توانایی وەرگرتن و لێکدانەوەی دروستی شتان ۲. بە توانایییەکی کەمەوە بۆ تێگەیشتنی قسە یان هەڵسەنگاندنی هۆی ڕووداوان.

**کور** / kavar ، ـها/: *اسم.* شەفەلە؛ شێفە؛ شێفەلەتە؛ کەبەر؛ شەفەلاح؛ کفر؛ تەروو؛ بتەگیایەکی چڕ و پڕە بە لقی کولکن و گەڵای کەسک و گوڵی درشتی سپیەوە. شکۆفەی نەترووکاوی ئەم بتەیە بۆ بۆنخۆشی بڕێ ترشی بە کار دەچێ.

**کور**[1] / kûr ، ـها؛ ـان/: *اسم.* کوێر؛ کۆر؛ کوور؛ کۆرە؛ نابینا؛ بێچاو؛ لۆر؛ نەوین؛ قلاپووک؛ کەسێ کە هەستی بینایی کار ناکا ‹کور از خدا چه می‌خواهد؟ دو چشم بینا: کوێر لە خودا چی دەوێ؟ دوو چاوی ساغ›.

**کور**[2]: *صفت.* کوێر؛ کۆر؛ کۆرە: ۱. بێچاو؛ نابینا؛ نەوین؛ مجرۆ؛ بێبەهرە لە هەستی بینایی ۲. بەسراو؛ لە کارکەوتوو ‹اجاق کور: وجاخ کوێر› ۳. *[مجازی]* بەبێ توانایی داوەری یان هەڵسەنگاندنی دروست ‹بی‌سواد کور است: بێخەت کوێرە›.

⊡ **کور خواندن:** *[تعریض]* سوار ئەسپی با بوون؛ بە هەڵە(دا) چوون؛ نەپێکان؛ نەپێکەی ‹کور خواندی آن‌قدرها هم خنگ نیست: سوار ئەسپی با بووی ئەوندەش گێژ نیە›.

**کور کردن:** ۱. کوێرکردن؛ کۆرکەردەی؛ نابینا کردن ۲. بەستن؛ لوولەی تراو یان گازێک

کـپ کـردن ٣. کـوێرەوکردن؛ کوێرکردنـەوە؛ کۆرەوەکەردەی؛ سـەتماندن؛ ڕەدمانـدن؛ بـە خاک، بیر یان کاریز پڕ کردنـەوە ‹چاه را کـور کـرد: بیرەکـەی کـوێر کـردەوە› ٤. *[مجـازی]* کوێرکردنەوە؛ لە کار خستن ‹این شیوەی درس خواندن ذهنش را کور کردە: خوێنـدن بـەم شـێوازە زەینی کـوێر کردۆتـەوە› ٥. *[مجازی]* تێکـدان؛ شیواندن ‹عیشمان را کور کردند: خۆشیەکەیان لێ تێکداین›.

**کـــوراب** / kûrāb ، ـهـا/:/اسـم. جۆلـەی سەرداپۆشراو یان لوولەی ئـاوی گـەورە لـە ژێـر زەویدا.

**کـــورار** / korār/: [؟]/اسـم. کـورار؛ مـاکێکی ژەهراوی لە برێ گیای ئامریکـای باشـووریدایە، هۆی فەلەجی ماسوولکەی لەشـە و بـە هەنـدی زۆر کەم دەرمانە.

**کوران** / kûrān/: [فرانسوی] ☜ **جریان ـ١**

**کوربــــاطن**/ kûrbāten/: [فارسـی/ عربـی] ☜ **کوردل**

**کورتاژ** / kurtāj/: [فرانسوی]/اسم. *[پزشکی]* کورتاژ؛ کـاری تاشـین و هەڵکـڵۆشـانی نـاوەوەی ئەندامێکی لەش بە ئـامرازێکی وەک کـەوچک، بەتایبەت تاشینی پزدان و دەرهێنانی تۆڵ.

**کورتکس** / korteks/: [فرانسوی]/اسم. قشـر مـخ ☜ **قشر**

**کورتن** / korton/: [انگلیسی] ☜ **کُرتُن**

**کورتیزون** / kortîzon/: [فرانسوی] ☜ **کُرتیزۆن**

**کورچـاتوویم** / korčātov(i)yom/: [انگلیسـی] /اسم. کورچاتۆڤـیوم؛ تـوخمی کیمیـاوی ڕادیۆئەکتیڤ بە ژمارەی ئـەتومی ١٠٤، کـە لـە دارشـــتەی نـــاوکی پروتـــاکتینیومی ٢٤٢ و نیئونی٢٢ بە دەسـت دێ و نیوەتەمـەنێکی زۆر کورتی هەیە.

**کوردل** / kûrdel ، ـان/: صفت. *[مجازی]* کوێردڵ؛ کـۆردڵ؛ دڵ کـوێر؛ کـەمفـام؛ دەبـەنگ؛ ناتێگەیشتوو؛ بەبێ توانـایی وەرگـرتنی هەسـتی عـاتیفی (وەک میهـر، دۆسـتایەتی، ئـەوین، ...):

**دل کور؛ کورباطن**. هەروەها: **کوردلی**

**کوررنگی** / kûr.rangî ، ـها/:/اسم. کـوێرڕەنگی؛ نەخۆشـینێکی چـاو کـە دەبێتـە هـۆی بـەدی نـەکردنی ڕەنگـی سـوور و سـەوز یـان هـەموو ڕەنگێک. هەروەها: **کوررنگ**

**کـــورس** / kûrs/: [فرانسـوی]/اسم. کـوورس: ١. سەر؛ یەکەی بژاردنی جاری سـوار بـوون لـە ماشینی هەموانی بۆ ڕۆیشتن بۆ جێگایەک ‹برای رفتن تا ادارە بایـد دو کـورس اتوبـوس سـوار شـوم: بـۆ ڕۆیشتن تا مەزرینگە دەبێ دوو سـەر سـواری پـاس بم› ٢. کێبـەرکێ؛ ڕکەبـەرکێ؛ بەتایبـەت بـۆ خێرایـی ‹ماشـینها بـا هـم کـورس گذاشـتە بودنـد: ماشینەکان پێکەوە کوورسیان دانابوو›.

**کورسو** / kûrsû/:/اسم. تـرووسـکە؛ چرووسـکە؛ چریسـکە؛ تریسـکە؛ برووسـە؛ زریـوەی کـەم ‹کورسویی ز چراغی رنجور، قصەپرداز شب تنهاییست: ترووسکەیەک لە زەردەدلـۆپێکی کـز، ئاودەنگیلـەی شەوانی تەنیاییمە›.

▣ **کورسو زدن**: چرووسکە دان؛ تـرووسـکە دان؛ زریوەیەکی کەم دانەوە ‹چراغی کورسو میزد بـە نیـزار: چرووسـکـەی دەدا چرایـەک بـە سـەر قامیشەلاندا›.

**کورسـی** / kûrsî/: [فرانسـوی] *صفت*. کوورسـی؛ تایبەت بـۆ کێبـەرکێ ‹ماشین کورسی: ماشـێنی کوورسی›.

**کـــورک** / kûrak ، ـهـا/:/اسم. ئـارێنج؛ کـوان؛ کونک؛ کـۆن؛ کـەوەن؛ ئاشـین؛ کـونێر؛ قـونێر؛ گـۆنر؛ چافـک؛ پەڤـیژۆک؛ مـادە؛ لـۆک؛ هاڵـی؛ دومەڵ؛ دمەڵ؛ دومەڵـە؛ دومـل؛ دومـڵ؛ بلـۆقی چلکینی بەژان کە لە ژێر پێستەوە دەردێ.

**کور ـ کور** / kûrkûr ، ـها/: [کردی]/اسم. کوڕـکوڕ؛ قەتێ؛ قەتا؛ ڕێخەخۆرە؛ پەلەوەرێکە بە باڵی درێژ و گۆشـەدار، جووچکـەی دوولـق و هەڵـفرینی

سووکەوە، کە لە سەر دار هێلانە دەکا و جار-جاریش لە لاشەی گیانەوەرانی‌تر دەخوا.

**کورکورانه**[1] / kûrkûrāne/: صفت. کوێرانە؛ کۆرانە؛ بەبێ بینش و ئاگاییەوە ‹اطاعت کورکورانه: گوێڕایەڵی کوێرانە›.

**کورکورانه**[2]: قید. کوێرانە: ۱. کوێرەکوێر؛ کۆرەکۆر؛ وەکوو کوێران ‹کورکورانه روی میز دست مالیدم: کوێرەکوێر دەستم بە سەر مێزەکەدا ساوی› ۲. بەبێ بینش، تێفکرین و ئاگادارییەوە ‹کورکورانه از او پیروی می‌کرد: کوێرانە کەوتبووە شوێنی›.

**کورمار** / kûrmār/ ☜ **بوآ**

**کورمال**/ kûrmāl/: قید. بە پەلەکوتێ؛ پەل‌کوت؛ پەلەماشێ؛ بە شێوەی پەل کوتان و کەلک وەرگرتن لە دەست بە جێگەی چاو ‹کورمال از پله‌ها پایین آمدم: بە پەلەکوتێ لە پلیکانەکانەوە هاتمە خوار›.

**کوره**[1] / kûre/: اسم. ۱. /ها/ داش؛ کوورە؛ کویرە؛ ئاگرخانە؛ چەشنێ کوانووی سەرداپۆشراو بۆ بەدیهێنانی گەرمای زۆر ‹کورەی آجرپزی: کوورەی ئاجورپێژی› ۲. [نجوم] وێنەی ئاسمانی لە لەتەگۆی باشووری نێوان قەیتووس و نەهردا ۳. /ها/ ڕاڕەوی کارێز.

◻ **از کوره دررفتن**: چاو پەڕینە تەوقی سەر؛ دین لە لا نەمان؛ هەڵچوون؛ زۆر توورە بوون ‹بالاخره پدر از کوره دررفت و زد شیشه را شکست: ئاخری بابم چاوی پەڕیە تەوقی سەری و دای لە شیشە و شکاندی›.

**کوره ـ**[2]: پیشواژه. کوێرە ـ؛ کۆرە ـ؛ کەم یان سست ‹کوره‌راه؛ کوره‌سواد: کوێرەڕێ؛ کورەسەواد›.

**کوره‌پز** / kûrepaz، ـها؛ ـان/: اسم. کوورەپەز؛ کوورەپێژ: ۱. خاوەن یان بەرپرسی کوورەخانە ۲. کرێکارێ کە لە کوورەپێژیدا کار دەکا ✻ **آجرپز**

**کوره‌پزخانه** / kûrepazxāne، ـها/: اسم. کوورەخانە؛ کوورەپەزخانە؛ جێگایەک کە بۆ پێژانی ئاجور، کاشی و... کوورەیان تێدا دروست کردووە.

**کوره‌پزی** / kûrepazî/: اسم. کوورەپەزی؛ کار و ڕەوتی پێژان و بەرهەم هێنانی دەسهاتی وەکوو ئاجۆر و کاشی لە کوورەدا.

**کوره‌راه** / kûrerāh، ـها/: اسم. کوێرەڕێ؛ کۆرەڕا؛ کوورەڕێ؛ تووڵەڕێ؛ باریکەڕێ؛ ڕێچکە؛ شقاڕێ؛ شقەرێ؛ شقیلە؛ ئاهەڕا؛ ڕەپێڵگە؛ بزنەڕێ؛ وڵاخەڕێ؛ ڕێگەی تەسک و بە پێچ و پڵۆچ کە بە هۆی هاتوچۆی خەڵک و چوارپێیان بەدیهاتووە.

**کوره‌سواد** / kûresavād/: [فارسی/ عربی]/اسم. کوێرەسەواد؛ سیواتی کەم.

**کوری** / kûrî/: اسم. کوێری؛ کۆری؛ کوێریەتی؛ کوێریتی؛ لیلوی: ۱. مجرۆیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کوێر و بێ‌چاو بوون ۲. هەر نەخۆشینێ کە ببێتە هۆی نابینایی.

◻ **به کوری چشم کسی**: [تعریض] بە کوێرایی چاوی کەسێک؛ بۆ دوژمن کوێری؛ وە کوێری چاو کەسێک ‹بە کوری چشم تو همین امسال می‌روم دانشگاه: بە کوێری چاوی تووە هەر ئەو ساڵ دەڕۆم بۆ زانستگا›.

**کوری** / kurî/: [فرانسوی]/اسم. کووری؛ یەکەی کاردانەوەی ماکی ڕادیوئەکتیڤ، بەرامبەر بە $3/7 \times 10^{10}$ جار لێکبوونەوە لە چرکەیەکدا.

**کوریم** / kûr(i)yom/: [فرانسوی]/اسم. کوریۆم؛ توخمی کیمیایی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ، لە دەستەی ئاکتینیدەکان، بە ژمارەی ئەتومی ۹۶، کە ناپایەدارە و بە شێوەی دەسکرد دروست دەبێ و لە بەر هەواوە زۆر زوو دەپووچێتەوە.

**کوز** / kavaz/ ☜ **خَرچُسونه**

**کوزل** / kozal، ـها/: [کردی]/اسم. کۆزەڵ؛ کۆزەر؛ کۆزر؛ کوێزر؛ کۆزەرە؛ گوێزر؛ چەت؛ چەڵۆک؛ چەڵووک؛ قەبەس؛ درشتەی لە گێرەدا

نەهاڕدراو

**کوزه** / kûze ، ـها/: [از کردی]/اسم. گۆزه؛ گوزک؛ گۆزێ؛ کووزه؛ کووز؛ کۆز؛ هالووه؛ مەر؛ قوم؛ جەڕه؛ تنگلی؛ دەفرێکی گرۆڤەر بە سکی هەڵاتوو و زۆرتر لە سواڵەت بۆ هەڵگرتنی تراو ‹کوزەی آب؛ کوزەی عسل: گوزەی ئاو؛ کووزی هەنگوین›.

**کوزه‌گر** / kûzegar ، ـها؛ ـان/: [از کردی/ فارسی] /اسم. گۆسکەر؛ گۆزەکەر؛ کووزەکەر؛ هەوڕگەر؛ پیرۆت؛ کاسەکەر؛ ئیربارکەر؛ هەوڕگەر؛ ئیربارگەر؛ پرۆت؛ کاسەوکووزەکەر؛ هۆستای ئامانان؛ کەسێ کە دەفری سواڵەت چێ دەکا.

**کوزه‌گری** / kûzegarî/: [از کردی/ فارسی]/اسم. گۆسکەری؛ گۆزەکەری؛ هەوڕگەری؛ کاسەکەری: . کار و ڕەوتی دروستکردنی گۆزه ۲ پیشەی هەوڕگەر ۳. /ـها/ کارگەی گۆزه دروست کردن.

**کوژ** / kûj/: صفت. [ادبی] قۆز؛ کۆم؛ کۆڤ؛ کووڕ؛ قۆخ؛ خووز؛ خوز؛ قۆپ؛ قەمبوور؛ داچەماو: ۱. بە پەڕانپەڕی چەماوه بەرەو ناوەوه ۲. زۆپ؛ قوت؛ بە هەڵاتوویی ڕوو بە دەرەوه.

**کوژپشت** / kûjpošt ، ـها؛ ـان/: صفت. پشتکووڕ؛ پشتکۆم؛ پشتچەماو؛ پشتچەمیای؛ پشتخوویل؛ پشتقۆز؛ کووڕ؛ کۆڕ؛ خوز؛ خووز؛ خووژ؛ خوول؛ کۆم؛ قلووچ؛ گۆڤ؛ کۆڤل؛ قۆغ؛ چەمیو؛ قۆق؛ قوولووز؛ قەلووز؛ نووخ؛ قەمبوور: . بە هەڵاتوویی لە پشتدا (وەک جۆرێ نەخۆشی) ۲. خاوەن پشتی چەماوه (زۆرتر لە بەر پیری): **گوژپشت**

**کوژی** / kûjî/: اسم. کۆمی؛ کووڕی؛ چەماوەیی؛ قۆزی؛ قۆپی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کۆم بوون.

**کوس** / kûs ، ـها/: اسم. کۆس؛ تەپڵی گەورە کە لە پێشوودا، بەتایبەت بۆ شەڕ دەیانژەند.

⊡ **کوس بستن**: پەلار بۆ بردن؛ دابەڕزین؛ هەڵبەزین؛ تەیار بوون بۆ هەڵمەت بردن بەرەو شتێک ‹گربەای کوس بست کە قناری را بگیرد: پشیلەیەک پەلاری بۆ قەناریەکە برد بیگرێ›.

**کوسن** / kûsan ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. باڵنج؛ باڵشتێکی چکۆلە بۆ پاڵ پێوه دان و دانان لە ژێر ئانیشکدا.

**کوسه** / kûse ، ـها/: اسم. کۆسە؛ کووسە: ۱. سەماسی؛ کۆسەماهی؛ هەر یەکە لەو ماسیانە کە لە زەریاکان بەتایبەت ئاوی گەرمدا دەژین و گۆشتخۆرن و زۆرتر ماسی ڕاو دەکەن: **ماهی کوسه** ۲. هورم؛ دەکەل؛ پیاوی بێ ڕیش و سمێڵ یان بە ڕیش و سوێڵی زۆر تەنکەوه.

▣ **کوسه و ریش پهن**: [مجازی] کەر و کولەنجە؛ ورچ و عابا؛ کۆسە و ڕیش پان (بۆ دوو شتی دژ بە یەک دەگوترێ).

**ـکوش** / kûš/: پیوازه. کۆش؛ کۆشەر ‹سختکوش: سەختکوش›.

**کوشا** / kûšā/: صفت. کۆشا؛ تێکۆشەر؛ خاوەن خۆ و هۆگرەتی تێکۆشان ‹پسر کوشا؛ کارگر کوشا: کوڕی کوشا؛ کرێکاری تێکۆشەر›.

**کوشش** / kûšeš ، ـها/: اسم. کۆششت؛ کۆشش؛ کرد و کاش؛ کرد و کۆش؛ کاش؛ وێ؛ حەوڵ؛ هەوڵ؛ هاڤل؛ کار؛ کرد؛ تەپشت؛ کەفتولەفت؛ پەلوپۆ؛ متملو؛ داکۆکی؛ خەبات: . کار و ڕەوتی کۆشان ۲ کاری درێژخایەن، زەینی یان بە لەش.

⊡ **کوشش کردن**: کۆشان؛ کۆشین؛ کۆششت کردن؛ هەولدان؛ تەقالا دان؛ کرد و کۆش کردن؛ خەباتکردن؛ خەبتین؛ پێکول کرن؛ پەلوپۆ کردن.

**کوشک** / kûšk ، ـها/: اسم. کۆشک؛ کوشک؛ کۆشکە؛ کاخە؛ کوچک؛ کاخ؛ خانووی گەورە و بەشکۆ لە نێوان باخێکدا.

**کوشی** [1] / kûšî/: اسم. کووشی؛ گرۆیەک لە زمانگەلی حامی باو لە ئافریقای ڕۆژهەڵاتی بەتایبەت ئیتیۆپی و سووماليدا.

**ـكوشي**[2]: *پیوازه.* ـكۆشی؛ كۆشان ‹سختكوشی: سەختكۆشی›.

**كوشیدن** / kûšîdan/: *مصدر. لازم.// كوشیدی:* تێكۆشای؛ **می كوشی:** تێدەكۆشی؛ **بكوش:** تێكۆشە// تێكۆشان؛ تێكۆشین؛ كۆشین؛ كۆشان؛ كۆشەی؛ كۆشای؛ ولایین؛ خەبتان؛ خەبتین؛ تەقالا دان؛ هەوڵدان؛ خەبات كردن؛ بۆ گەیشتن بە مەبەستێك بەردەوام كاركردن.

■ صفت فاعلی: **كوشنده** (تێكۆشەر)/ صفت مفعولی: **كوشیده** (تێكۆشاو)/ مصدر منفی: **نكوشیدن** (تێنەكۆشان)

**كوف** / kûf/: *اسم.* ١. چەشنێ لە پەلەوەرانی دەستەی كوند، بە باڵای مامناوندی و گوێی درێژ و چاوی گەورەوە ٢. ـها/ كوندەقوتە؛ كوندی دارسان؛ پەلەوەرێكی لێرەواری كە دەگمەن لە هێلانەی دەردەكەوێ، باڵ و پەلەكانی وەكوو گەڵای دار وایە و مشكی سارا ڕاو دەكا.

**كوفت** / kûft/: *اسم.* ١. سفلیس؛ فەرەنگی؛ هالۆق؛ بای بوور؛ نەخۆشیەكی كۆنی پەتایە كە تووشی ئەندامانی شەرم دێ ٢. گەرانی؛ سننان؛ قوزولقورت؛ قزەلقورت؛ قوزولقورت؛ دەرد كاری؛ جنێوێكە.

⊡ **كوفت كردن:** *[تعریض]* ژەقنەمووت كردن؛ كردنە زەهری مار؛ خواردن ‹یک قابلمە پلو را كوفت كردی، باز می‌گویی گرسنەام؟!: مەنجەڵێک پلاوت ژەقنەمووت كرد، هەر ئێژی برسیمە؟!›.

**كوفتگی**/ kûftegî/: *اسم.* ١. كوتراوی؛ كوتیاگی؛ تلكوو؛ ئێشی ماسوولكەیی بە هۆی ماندوویی و كوتران یان پەتاوە ٢. هیلاكی؛ شەكەتی؛ مانیایی؛ ماندوویەتی زۆر.

**كوفتن** / kûftan/ ☜ **كوبیدن-٢**

**كوفته**[1] / kûfte ، ـها/: *اسم.* كفتەشۆربا؛ كفتەشۆروا؛ كفتەوشۆروا؛ خۆراكێک لە گۆشتی چەرخكراو، سەبزی، برنج، ئاردی نۆكەقەنی یان نەخوەشەر و... كە پێكەوە تێكەڵی دەكەن و وەكوو هەویرێكی لێ دێ، تۆپەڵ- تۆپەڵی دەكەنەوە و كاكڵە و خورما و هێلكە و... تێ دەخەن و لە ئاوێكی بە هێندێک برنج و چێژەوە دەیكوڵێنن: **كوفتەتبریزی**

**كوفته**[2]: *صفت.* ١. كوتراو؛ كوتیاگ ٢. كەشەنگ؛ شەكەت؛ مانیا؛ ماندوو و هیلاک بە هۆی كار و چالاكی زۆرەوە.

**كوفتەتبریزی** / kûftetabrîzî/ ☜ **كوفته**[1]

**كوفتەریزه** / kûfterîze ، ـها/: *اسم.* كفتەڕیزە؛ كفتەڕیزە؛ چەشنێ كفتەی چكۆلە و تۆپەڵ كە دوای سووركردنەوە لە ڕۆندا لە نێو ئاوێكی بە هێندیک برنج و چێژەوە دەیكوڵێنن.

**كوفتەشامی** / kûftešāmî ، ـها/: *اسم.* كفتەشامی؛ كفتەشامیێ؛ چەشنێ كفتە وەكوو كوتلێت كە دوای سووركردنەوە لە ئاوێكی كەمدا دەیكوڵێنن.

**كوفتەقلقلی** / kûfteqelqelî ، ـها/: *اسم.* كفتەقلقلی؛ گۆشتی بە پیوازەوە چەرخكراوی وەک هەڵمات لێهاتوو كە لە ڕۆندا سووری دەكەنەوە و بۆ تام دەیكەنە نێو چێشتیترەوە.

**كوفتی** / kûftî/: *صفت. [گفتاری]* میراتی؛ خەیبمەردە؛ خاوەنمردی؛ خەیبكەوتە؛ جۆری جنێو و ناسزا ‹این كتاب كوفتی را بینداز دور!: ئەم كتێبە میراتیە فڕێ دە!›.

**كوفی**[1] / kûfî/: [عربی]/*اسم.* كووفی: ١. ڕێنووسێكی كۆنی عەرەبی كە لە ڕابردوودا بۆ نووسینی دەفتەر و بەیاز بە كار دەبرا ٢. ـها/ ـان/ خەڵكی شاری كووفە.

**كوفی**[2]: *صفت.* كووفی؛ پێوەندیدار یان سەر بە شاری كووفەوە.

**كوفیه** / kûfiye ، ـها/: [عربی] *اسم.* چەفیە؛ چەپیە؛ ڕووبەندێكی چوارگۆشە كە پیاوانی عارەب بە سەریدا دەدەن.

**كوک**[1] / kûk ، ـها/: *اسم.* كۆک: ١. قورمیش؛

پێچ، کلیل یان ئامێرێک بۆ تەیارکردنی ئامراز یان دەسگایەک ‹کوک ساعت؛ کوک پیانو: کوکی کاتژمێر؛ کوکی پیانۆ› ۲. *[خیاطی]* قومامە؛ کت؛ چەشنێ دروومانی درشت کە بۆ ماوەیەکی کورت لە بەرگی دەدەن.

◘ کوک زدن: کۆک لێدان؛ قومامە لێدان؛ بە بەنی ئەستوور و کەمبەرگە تەقەڵ لێدان ‹سرآستین را کوک بزن بده من تا چرخ کنم: سەرقۆڵەکە کوک لێدە و بیدە من تا چەرخی کەم›.

توی کوک کسی/ چیزی رفتن: *[مجازی]* تێڕامان؛ ورد بوونەوە و لێکۆڵینەوە لەمەڕ کەسێ/ شتێکەوە.

**کوک**[۲]: *صفت.* ۱. کۆک؛ ڕێکوپێک؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی مرێسەوە ۲. *[مجازی، گفتاری]* گرگین؛ گرژ؛ زویر؛ تووڕە؛ درژ؛ قەلس؛ بەهەجۆک؛ بەقین؛ هێچی؛ هیچ ۳. *[مجازی]* کۆک؛ بەدەماخ؛ میزان؛ کەیفساز ٤. *[مجازی، گفتاری]* تەیار؛ ئامادە؛ گیف.

◘ کوک بودن: کۆک بوون؛ مرێس بوون. هەروەها: **کوک شدن؛ کوک کردن**

کوک بودن از دست کسی/ چیزی: *[مجازی]* قرم لە کەسێ/ شتێک پڕ بوون؛ لە کەسێک تووڕە بوون ‹معلم خیلی از دستمان کوک است: مامۆستا فرمی لیمان زۆر پرە›.

کوک بودن کیف کسی: *[مجازی]* کەیفی کەسێک ساز بوون؛ کۆک بوونی کەسێک؛ زۆر سەرخۆش بوون ‹پیداست کیفت حسابی کوک است: دیارە کەیفت تەواو سازە›.

از کوک افتادن: کۆک شێوان؛ ترازیان؛ لە میزانی خۆ دەرچوون ‹ساعت از کوک افتادە است: کاتژمێرەکە کوکی شیواوە›.

**کوکا** /kokā, kukā/: [فرانسوی] *اسم.* کوکا؛ دارچکێکی خۆڕسکی ئامریکای باشووری، بەتایبەت کۆسارانی ئاند، بە گەڵای هێلکەیی و بۆی وەک چای و تامی تاڵەوە کە ماکی کوکائینی لێ بەرهەم دێنن.

**کوکائین** /kokā'în/: [فرانسوی] *اسم.* کوکایین؛ ئالکالۆییدێکی خۆگر و سپی ڕەنگی بێهەستکەرە کە لە گەڵای گیای کوکا دەگیریت و ماکێکی خاوکەرە.

**کوکب** /kowkab, ko:kab، ـها/: [عربی] *اسم.* ۱. /کَواکب/ هەسارە؛ ئاسارە؛ تەنی ئاسمانی درەوشان (وەکوو هەتاو و ئەستێران) ۲. کەوکەو؛ گوڵەبژوێن؛ گوڵەئەستەمبوولی؛ گیایەکی ڕازێنەیی هەمیشەیی بە ڕیشەی ئەستوور و گوڵێکی پڕ و جوانەوە ۳. کەوکەو؛ گوڵی ئەو گیایە.

**کوکتل** /koktel/: [فرانسوی] *اسم.* کوکتیل: ۱. خواردنەوەیەکی ئەلکولی کە لە تێکەڵکردنی چەند نووشابە دروست دەبێ ۲. جۆرێ سۆسیسی پرگۆشتە.

**کوکتل‌پارتی** /koktelpārtî، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* میوانی دوای نیوەڕۆیان هاورێ لەگەڵ بەخێر هێنانی میوانان بە خواردنەوەی ئەلکولی.

**کوکتل‌مولوتف** /koktelmolotof، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* کوکتیل‌مولوتوف؛ چەکی ئاورزای دەسکردی ساکار بە شێوەی بوتڵێک پڕ لە ماکی ئاورگر (وەکوو بەنزین) کە فتێلەیەکی لە نێو دەنێن و پێش فڕێ دان ئاوری دەدەن.

**کوکر** /kûkar/: *اسم.* کووکووکەرە؛ تیرەیەک باڵندەی لە بیچمی کەو بەڵام گچکەتر، فرینی وەک کوتر، بە باڵی درێژ و پای کورتەوە.

**کوکنار** /kûknār، ـها/: *اسم.* کۆکەنار؛ ئالفەگیایەکی گوڵبنەوشی میوەچکۆلەی وەک هێلکەی کون-کون و دەنک ڕەشە.

**کوکو** /kûkû، ـها/: *اسم.* کووکوو؛ خواردەمەنیەک لە تێکەڵی سەوزی یان سێفەزەمینی و ئارد و هێلکە کە لە ڕۆندا سووری دەکەنەوە ‹شام کوکو داشتیم: شێو

کووکوومان بوو›.

**کـــوکی** / kûkî/: *صفت.* کـۆکی؛ قورمیشــی؛ قورمیشـــیه؛ کۆکـــدار ‹ماشـین کـوکی: ماشـینی کۆکی›.

**کوگار** / kûgār/: [؟] ☜ شیر کوهی، **شیر**

**کول** / kûl/: *اسم. [گفتاری]* کۆڵ؛ کووڵ؛ ناوشـان؛ سەرشـان؛ شـانەدوش؛ قلمـدوش؛ قەلانـدوش؛ کلیتە؛ پشت، بەتایبەت بەشی سـەرووی پشـتی مرۆ.

▣ **کـول کـردن/ گـرفتن:** گرتنـە کۆڵـەوە؛ بـە کۆڵــەوەگرتن؛ لـە کـۆڵ کـردن؛ کـۆڵ کـردن؛ گێرتــەی کۆڵــێ؛ وەگیریــایش؛ لــە ســەر قەلاندوش نان ‹پیرمـرد را کـول کـرد و بـرد بـالا: پیرەمێردەکەی گرتە کۆڵەوە و بردیە بان›.

**به کول کشیدن:** بە کۆڵ کێشان؛ لە سەر شان و ملی خۆ بردن ‹همـه را بـه کـول کشـید و آورد: هەمووی بە کۆڵ کێشا و هێنای›.

**کـولا** / kolā ، ـها/: *اسم.* کـۆلا: ١. [؟] دارێکـی تایبەتی ئافریقای ڕۆژئاوایی بە گـەڵای سـاکار و ناوەناو، گوڵێ کە لە سەر لاسکی تـازەوە بـەدی دێت و دانـەی وردیلـە کـە بـۆ داروو و دەرمـان دەشـــێ: **کُـــلا** ٢. [انگلیســـی] هـــەموو جـــۆرە خواردنەوەی گازداری بێ‌ئەلکول.

**کولاژ** / kolāj/: [فرانسوی] ☜ **کُلاژ منت**

**کولاژن** / kollājen/: [فرانسوی] ☜ **کُلّاژن**

**کولاک** / kûlāk/: [ترکی]/*اسم.* ١. کرێوە؛ کلێلە؛ کەڤێلە؛ کلافـە؛ کرێڤـە؛ کروڤـە؛ کەڕۆڤـە؛ بـاوە؛ باووە؛ بـاهووە؛ بـادەوە؛ بـادەڤ؛ بـاداوە؛ بانـدەر؛ ڕۆڤە؛ باسریشک؛ وەلەک؛ وەللک؛ هێشی؛ هۆڵ؛ چرەچەمان؛ کەویەبەفر؛ شاپە؛ تۆفە؛ تۆف؛ پوک؛ پەلەتاتـە؛ باپوسـکە؛ بـاپوک؛ بـابووک؛ بلێـک؛ باکوت؛ بەفر و بۆرانی هاوڕێ لەگەڵ با و باگژەی بەقەوەتدا ٢. باسریشکی دەریا کە دەبێتە هـۆی بەرز بوونەوەی شەپۆلان.

▣ **کولاک شدن:** بوونە کرێوە؛ باوە بـوون ‹تـوی راه که آمدیم کولاک شد: لە ڕێدا کە دەهاتین بـووە کرێوە›.

**کولاک کـردن:** *[مجازی]* گاڵـەکردن؛ حەشـر کردن؛ تەقاندنەوە؛ کـارێکی سەرسـووڕێنەر و بـــاش کـــردن ‹ورزشـــکاران کـــولاک کردنـــد: وەرزشکارەکان گاڵەیان کرد›.

**کولبـار** / kûl(e)bār ، ـهـا/: *اسم.* کـۆڵ؛ کۆڵـە؛ کۆڵەپشت؛ کۆڵەبار؛ پشتە؛ تێلەکە؛ بارگە؛ بـارێ کە لە سەر پشتی دەبەستن: **کولەبار**

**کـــولر** / kûler ، ـهـا/: [انگلیســی]/*اسم.* کـــوولێر؛ ئامرازێکی زۆرتر کارەبایی بـۆ فێنـک‌کردنـەوەی جێگایەک.

▣ **کولر آبی:** کـوولێری ئـاوی؛ ئـامێرێ کـە بـە هەڵمژینی هەوا لە جێگایەکی شۆدارەوە، بای فێنک دروسـت دەکـا و بـۆ جێگایـەکی تـری دەنێرێ.

**کـــولر گـــازی:** کـــوولێری گـــازی؛ ئـــامێرێکی کارەباییە کـە هـەوا بـە سـەر چەنـد ڕزنێـک لوولەی بە گـاز ساردەوەبودا دەنێـرێ و بـەم شێوە بای سارد بەدی دێنێ.

**کولن** / kûlon/: [فرانسوی]/*اسم.* کوولون؛ یەکەی باری ئیلیکتریکی بەرانبەر بـە بـارێ کـە ڕەوتی یەک ئامپیر لە یەک چرکەدا هەڵیدەگرێ.

**کوله** / kûle/: [از کـردی]/*اسم.* کولـە: ١. بەشـی سەرەکی ڕەندە کە تێغەکە لە سەری سوار دەبێ ٢. /ـهـا/ کـۆڵ؛ تێلەکـە؛ تێلەگـە؛ کۆڵەپشـت؛ کۆڵبەند ٣. کوڵ؛ شارگە؛ بەرگە؛ کەلێن؛ کۆزک؛ کالیت؛ بنەی ڕاوچی کە خۆی تێدا پەنا دەدا ٤. کۆڵە؛ خۆڵەمێشی تەندوور.

**کوله‌بار** / kûlebār/ ☜ **کولبار**

**کوله‌پشتی** / kûlepoštî ، ـها/: *اسم.* کۆڵەپشتی؛ کۆڵەپشت؛ کوڵ؛ کۆڵ؛ کۆڵە؛ کۆڵبەند؛ تێلەکـە؛ تێلەگە؛ بارکوولە؛ کیف یـان توورەکەیـەک کـە کەژوانان لە سـەر پشـتی دەبەسـتن، بەتایبـەت کیفی بەندار کە بە شانەوەی دەکەن.

**کولی** / ko:lî, kowlî ، ـھا/: *اسم.* قەرەچی؛ قەرەچ؛ قەراجەدار؛ کۆچەر؛ کاولی؛ کاولی؛ کاوەلی؛ کەولی؛ کوولی؛ کێوەلی؛ دۆمی؛ کەجەر؛ نەوەر؛ هەر یەکە لە کەسانی زاگەبەری خێوەتنشین یان گەڕۆک لە هۆزی هیندی و لە تۆرەمەی هیندو- ئێرانی کە بە دنیادا بڵاو بوونەتەوە و زۆرتر لە ڕێگەی ئاواز خوێندن، مۆسیقا ژەندن، بەڕێوە بردنی شانۆی گەڕۆک و کاری دەستی و ئاژەڵداریوە دەژین.

**کولی** / kûlî/: *اسم. [گفتاری]* کۆلی؛ کۆلی-کولی؛ کۆڵ کۆلانی؛ سواری لە سەر قەلاندووشانی مرۆڤ.

▣ **کولی دادن**: کۆڵ دان؛ کۆلی دان؛ سوار کردنی کەسێک لە سەر کۆلی خۆ ‹هر وقت می‌باخت کولی می‌داد: کاتێ دایدەنا کولی دەدا›.

**کولی گرفتن**: کۆلی سەندن؛ لە سەر قەلادووشکانی کەسێک سوار بوون؛ سوار بوون لە سەر کۆلی کەسێک ‹اما هر وقت می‌برد کولی می‌گرفت: کاتێکیش دەیبردەوە کولی دەسەند›.

**کولیت** / kolît/: [فرانسوی] *اسم. [پزشکی]* کولیت؛ نەخۆشینی هەڵماسینی دوایین بەشی ڕیخۆڵەی گەورە (قوولون): **کُلیت**

**کولیدن** / kûlîdan/: [از کردی] *مصدر. متعدی.* کۆڵین؛ کۆڵینەوە؛ بن کۆڵی کردن؛ دانەوە؛ هلکەواشتن.

**کولیس** / kulîs/: [فرانسوی] ☜ **کُلیس**

**کومپوست** / kompost/: [فرانسوی/ انگلیسی] ☜ **کُمپوست**

**کومه** / kûme/ ☜ **کوخ**

**کومیس** / komîs/: [؟] *اسم.* کۆمیس؛ جۆرێ خواردنەوەی ئەلکولی گازدار کە لە هەڵهاتنی شیری مایین دروست دەبێ: **قومیز؛ قومیس؛ کفیر؛ کُمیز**

**کون** / kûn/: *اسم. [مستهجن]* ۱. کنگ؛ کن؛ قوون؛ قنگ؛ قین؛ قینگ؛ قووین؛ قونگ؛ قن؛ کینگ؛ عننە؛ کونی پشتی گیاندار کە پیسایی پێدا دەچێتە دەرەوە ۲. کەماخ؛ کاماخ؛ کلۆت؛ کلۆمت؛ کەلۆت؛ کورۆت؛ کلۆک؛ کەفەڵ؛ کەفەل؛ هێفەل؛ سوورین؛ پاشل؛ قالچە؛ سمت؛ سمتە؛ زۆپی ژێر ناوقەد و ژووری ڕان ۳. *[تعریض]* بن؛ خوارترین بەشی هەر شتێ.

**کونخیزه** / kûnxîze/: *اسم. [گفتاری، مستهجن]* قنگەخشکێ؛ قوونەخشکێ؛ قوونەقوون؛ کاری بە دانیشتن و لە سەر قوون ڕۆیشتن (وەک ڕۆیشتنی زارۆی قنگەنشینە).

**کون‌سوزه** / kûnsûze/: *اسم. [گفتاری، مستهجن]* قنگەسۆلە؛ ڕەوتی قوون سۆلانەوە؛ تووڕەیی و ڕەقی زۆر لە بەر ئێرەیی و ناتەواوی.

**کون‌گشاد** / kûngošād ، ـھا/: *صفت. [کنایی، مستهجن]* قنگ‌قورس؛ قوون‌گران؛ قوون‌فش؛ لەوس؛ تەوەزەل؛ تەپلمۆس؛ تەمبەڵی بێکارە.

**کون‌گشادی** / kûngošādî/: *اسم. [مستهجن]* قنگ‌قورسی؛ قوون‌گرانی؛ قوون‌فشی؛ لەوسی؛ تەپلموسی؛ تەوەزەلی؛ تەمەڵی و بێکارەیی.

**کون‌وپیزی** / kûn-o-pîzî/: *اسم. [گفتاری، مستهجن]* قوون؛ قنگ؛ لێهاتوویی؛ توانایی ‹او کون‌وپیزی کار کردن نداشت: کابرا قوونی کار کردنی نەبوو›.

**کون‌ومکان** / kown-o-makān, ko:n- ، ـھا/: [عربی] *اسم. [ادبی]* جیهان؛ ئاسمان و زەوین؛ هەمو دنیا و ئەوەی کە تێیدایە.

**کونه** / kûne/: *اسم. [گفتاری]* قنگە؛ قن؛ بەشی ژێرین یان دوایینی شتێک ‹کونەی خیار؛ کونەی تفنگ: قنگەی خەیار؛ قنی چەک›.

▣ **کونەی آرنج**: قنانیسک؛ قنگانیسک؛ زۆپی ئێسکی پشتی باهۆ.

▣ **کونەی ترازو زمین زدن**: *[کنایی]* خۆگرتن؛ بۆ هاندانی کەسێک، نازکردن و خۆ بێ‌مەیل نیشاندان ‹پدر دختره اول قدری کونەی ترازو زمین

زد اما خیلی زود نرم شد: بابی کچەکە هەوەڵ کەمێک خۆی گرت، بەڵام زۆر زوو نەرم بوو›.
**کونه کردن:** سەرک/ سەرەک کردن؛ ڕەگ و پنج داکوتان؛ لە ڕیشەی گیا لۆ دروست بوون ‹اول بگذار پیازها کونه بکند، بعد آب بده: سەرەتا با پیوازەکان سەرەک بکەن، پاشان ئاویان بدە›.
**کونی** / kûnî/: *صفت. [مستهجن]* قووندەر؛ خوزگ؛ بەپشت؛ نێری گاندەر.
**کوه** / kûh، ـها/: *اسم.* کێو؛ کێف؛ کۆ؛ کەژ؛ کوو؛ کوویە؛ کویَ؛ کەش؛ کاش؛ کاژ؛ کەل؛ کێڤ؛ کاو؛ چیا؛ چا؛ بەندەن؛ بەنەن؛ جەوەڵ؛ کۆمایەکی گەورە و هەڵهاتوو لە توێکڵەی زەوین کە لە زەوینگەلی دەور و بەری و لە تەپۆڵکە بەرزترە.
◘ **کوه آتشفشان** ☜ **آتشفشان**
**کوه قاف** ☜ **قاف**
**کوه یخ:** ١. چیای سەهۆڵ؛ کۆمای گەورەی یەخی سەر ئاو کەوتوو کە لە یەخچاڵێ جویَ بۆتەوە ٢. *[مجازی]* سارد؛ سار؛ سەرد؛ ساردوسڕ؛ کەسی بێهەست و دڵسارد.
◘ **کوه کندن:** *[تعریض]* بەردکێشان؛ کوچککێشان؛ شەغرەکێشان؛ کێو/ کێفکەندن؛ کۆکەن کردن؛ کۆڵکێشان/ کێشتەی؛ کەش کەنتەی؛ تەوەن کێشتەی؛ کاری دژوار کردن ‹چه خبرت است؟ مگر کوه کنده‌ای که این‌قدر آخ و اوخ می کنی؟: چتە؟ مەگەر بەردت کێشاوە ئەوندە ئاخ و ئۆف دەکەی؟›.
**کوهان** / kowhān, ko:hān, kûhān، ـها/: *اسم.* کۆپار؛ کۆپارە؛ کۆپانە؛ پێل؛ دووگ؛ ملک؛ هەنج؛ زۆپی گۆشتی لە سەر پشتی تاقمیَ گوهانداری گەورە (وەک وشتر، مانگا، واڵ) کە زۆرتر چەوری و ئاوی تێدا کۆ دەبێتەوە.
**کوهپایه** / kûhpāye، ـها/: *اسم.* پێدەشت؛ بنار؛ پنار؛ گۆڕەپان؛ گەڕ؛ پای کەش؛ تەختانی بەرزی داوێنی چیا.
**کوه‌پیکر** / kûhpeykar/: *صفت.* گەورە؛ گاورە؛ گرد؛ زەلام: ١. بە هەیکەلی زۆر درشتەوە ‹اسب کوه‌پیکر: هەسپی گاورە› ٢. بە بارستایی زۆر زلەوە ‹ساختمان کوه‌پیکر: ساختومانی گەورە›.
**کوه‌پیمایی** / kûhpeymāyî، ـها/: *اسم.* کەشەوانی؛ کەژوانی؛ کەژەوانی: ١. کاری ڕیَ پێوان لە کێو و چیادا ٢. خولانەوە و هەڵچوون بە شاخ و داخدا.
**کوهزایی** / kûhzāyî/: *اسم. [زمین‌شناسی]* ڕەوتی پێکهاتن و بەدیهاتنی کێو.
**کوه‌زدگی** / kûhzadegî/ ☜ **کوه‌گرفتگی**
**کوهسار** / kûhsār/ ☜ **کوهستان**
**کوهستان** / kûhestān، ـها/: *اسم.* کوێستان؛ کوێسان؛ کێفسان؛ کوویەسان؛ کێوسار؛ کێوستان؛ شاخستان؛ کێوات؛ کێولان؛ زۆزان؛ کۆسار؛ کێفسار؛ کۆسان؛ کۆیوسان؛ مەڵبەندی کێوات؛ سەرزەوینی پڕ لە کەژ و کێو.
**کوهستانی** / kûhestānî/: *صفت.* کوێستانی؛ کۆساری؛ کێفسانی: ١. کەشی؛ هاوگەر بە چیاوە ‹آب و هوای کوهستانی: ئاو و هەوای کوێستانی› ٢. شاخاوی؛ خاوەن شاخ و داخ ‹سرزمین کوهستانی: سەرزەوینی کوساری›.
**کوه‌گرفتگی** / kûhgereftegî/: *اسم. [قدیمی]* نەخۆشینی بەرزایی کە بەتایبەت لە بلندایی ٣٠٠٠ میتر بەرەو ژوورە، بە هۆی کەم بوونەوەی ئوکسیژن بەدی دیَ: **کوه‌زدگی**
**کوه‌نشین** / kûhnešîn، ـها؛ ـان/: *اسم.* کێونشین؛ کێفنشین؛ ئەوەی کە لە کەژ و کۆیان دەژی.
**کوهنورد** / kûhnavard، ـها؛ ـان/: *اسم.* کەشەوان؛ کەژەوان؛ کەژوان؛ چیاڤان؛ زەردەوان؛ کۆگەرد؛ کەسیَ کە بە کەژ و کۆدا سەر دەکەویَ ‹چهار کوهنورد به قلەی آرارات صعود کردند: چوار کەشەوان لە چیای ئاراراتەوە سەرکەوتن›.
**کوهنوردی** / kûhnavardî، ـها/: *اسم.* کەشەوانی؛ کەژوانی؛ شاخەوانی؛ زەردەوانی؛

چیاڤانی؛ کاری چوونە سەر کێو و پێدا گەڕانی ‹برای کوهنوردی بە چهلچشمە رفتە بودند: بۆ کەشەوانی چووبوونە چلچەمە›.

**کوهە** / kûhe ، ـها/: اسم. کۆمە؛ بەرزی؛ هەر شتێکی بەرز و هەڵهاتوو ‹کوهەی ابر: کومەی هەور›.

**کوهی** / kûhî/: اسم. کێوی؛ کوویەی؛ کەشی؛ کێفی؛ کیڤی؛ کۆڤی؛ کوویی؛ کەیی: ١. کێفیلە؛ شاخی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کێو و چیاوەوە ‹گیاه کوهی: گیای کێوی› ٢. *[گفتاری]* کێونشین؛ نیشتەجێی کێوان.

**کوەیخ** / kûheyax/ ☜ **کوه**

**کوی** / kûy/: اسم. گەڕەک؛ تاخ: ١. بەشێ لە شار، بریتی لە چەند شەقام و کۆلان ٢. شاکووچە؛ کۆلانێکی گەورە کە چەن کووچەی چکۆلەی لێ دەبێتەوە ٣. کۆمەڵێک لە ماڵان لە جێگایەکی دیاریکراودا ‹کوی معلمان: تاخی مامۆستایان›.

**کویر** / kavîr ، ـها/: اسم. شافر؛ وشکارۆ؛ ئیشکارۆ؛ بیاوان؛ هۆل؛ کەویر؛ سارا؛ چۆڵی قاقڕ و بێئاو.

**کویرزدایی** / kavîrzedāyî/: اسم. کار و ڕەوتی لە نێو بردنی قسڵ و خوێی وشکارۆ و بەرهەڤ کردنی بۆ کشتوکاڵ.

**کویری** / kavîrî/: صفت. وشکارۆیی؛ شافری؛ بیاوانی؛ کەویری: ١. پێوەندیدار یان سەر بە ساراوە ‹آب و هوای کویری: ئاو و هەوای وشکارۆیی› ٢. بیاواندار ‹مناطق کویری: ناوچەی بیاوانی›.

**کویز** / kavîz/: [از کردی] اسم. *[قدیمی]* کەویج؛ کەویژ؛ قەفیز؛ کێشێک بووە بۆ پێوان.

**کویل** / koyl ، ـها/: [از انگلیسی] اسم. سیمپێچ؛ سیملوول؛ سیمێکی لوولپێچ کە بە هۆی تێپەڕینی کارەباوە، مەیدانی میگناتیسی بەدیدێنێ: **کوئل**

**کوینتت** / kûvîntet/: [انگلیسی] اسم. *[موسیقی]* کوینتیت؛ ئاهەنگێ بۆ پێنج ساز یان پێنج سترانبێژ.

**که**[1] / ke ، ـها/: ضمیر. کێ؛ کی؛ چ‌کەسێ ‹که بود؟ که گفت؟: کێ بوو؟؛ کێ گوتی؟›.

**که**[2]: حرف. کە: ١. وشەیەک بۆ پێوەندی وشە یان لێمایەک بە ڕاڤە یان هەواڵی سەر بە ئەو ‹وقتی رسیدم که او رفته بود: کاتێ گەیشتم کە ئەو ڕۆیشتبوو› ٢. *[گفتاری]* وشەیێ بۆ پێداگری و پەسەندی قسەی پێشوو ‹نه که نمی‌شود: نە کە نابێ› ٣. ئەگەر؛ ئەگە ‹آدم که به درد دیگران نخورد، برای لای جرز خوب است: بنیادەم کە بە دەم خەڵکەوە نەبێ، هەر نەبوونی باشە› ٤. چونکاتێ؛ چونکوو؛ چونکە ‹فرار کن که دارند می‌رسند: دەرچۆ کە خەریکن بگەن› ٥. بۆ؛ بۆیە؛ بۆ ئەوەی کە ‹بلند شد که آب بخورد: هەستا کە ئاو بخواتەوە› ٦. تا؛ لە ئاکامدا ‹تو زدی که او هم زد: تۆ دەستت وەشاندت کە ئەویش وەشاندی› ٧. کاتێ کە؛ ساتێ کە ‹به خانه که رسیدم برق رفته بود: کە گەیشتمەوە ماڵ بەرق نەبوو›.

**کهاد** / kehād/: صفت. ١. کەمبایەختر ٢. سەبارەت بە پاژ یان لایەنی گچکەتر.

**کهتر** / kehtar ، ـان/: صفت. *[ادبی]* چکۆلە؛ بچووک؛ بووچک: ١. بچووکتر؛ گچکەتر؛ بووچکتر؛ وردیتەر؛ کەم‌تەمەن‌تر ٢. ژێردەست.

**کهر** / kahar/: اسم. کوێت؛ کوێتە؛ کەهەر؛ کەرەبا؛ کیەر؛ کەهر؛ ئەسپی سوور.

**کهربا** / kahrobā, kahrabā/: اسم. کارەبا؛ کەرەبا؛ کاروا؛ کارەب؛ کەرەب؛ کەرەبە؛ کەهروبان؛ کەهروبا؛ کەهرەبا؛ جۆری جەوی وشک‌هەڵگەڕاو بە ڕەنگی زەردی کاڵە کە زۆرتر هەموو یان پاژێک لە لەشی میروویەکی تێدا ساغ ماوەتەوە و مۆروو، مۆمەقەند، وردەخشڵ و تەزبێحی لێ دروست دەکەن.

▣ **کهربای سیاه**: شەڤە؛ شەوە؛ شەوڕەنگ؛ شەوگ؛ شەوێ؛ شیا؛ بەردێکی کانگایی لە

جـۆری لیگنـیتی ڕەق بـە ڕەنگـی ڕەش و بریقـەداره کـە هێلەسـاو دەدرێ و لـە گەوهەرسازیدا بە کەڵک دێ

**کهربائی** / kahrobā'î, kahrabā'î/ ☜ **کهربایی**

**کهربـایی** [1] / kahrobāyî, kahrabāyî/: *اسم.* کارەبـایی؛ کـەهرەبایی؛ ڕەنگـی زەردی مـات: **کهربائی**

**کهربـایی** [2]: *صفت.* کارەبـایی؛ کـەهرەبایی؛ بـە ڕەنگی کارەبا؛ بە ڕەنگی زەردی مات: **کهربائی**

**کهریـز** / kahrîz ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* کـارێز؛ کەرێز؛ کەهرێز؛ کەهریز؛ کارێزە؛ ئاوەڕۆی بـەژێر زەویدا کێشراو.

**کهکشان** / kahkešān, kahkašān/: *اسم.* ١. /ـها/ کاکێشـان؛ کاکەشـان؛ کەشکەشـان؛ کـاکێش؛ کـادز؛ کۆمکاسـێویان؛ سـەرجەمی بـێ‌ئـەژمار ئەستێره و مانگ و خۆر له ئاسمان کـه پێکـەوه خولگەیەکیان هەیه ٢. ڕەیاکـاروان؛ کاکەشـانی ڕێگەی شیری، کە زەوی تێدایە.

▣ **کهکشـان راه شـیری:** ڕەیاکـاروان؛ سـپیایی ناوەندی ئاسمان کە لە تاریکە شـەودا وەکـوو کەمەربەندێکی گەوره دیاره.

**کهمـوج** / kehmowc, -mo:c/: [فارسی/ عربی] ☜ **مایکروویو**

**کهـن** / kohan/: *صفت. [ادبی]* ١. کـۆن؛ کۆنـە؛ کهـۆن؛ کەڤـن؛ دێـرین؛ کـەعن؛ کـان؛ کـەون؛ قەدیمی ‹بنای کهـن: بینـای کـۆن› ٢. دانسـاڵ؛ بەتەمـەن؛ پـیر؛ بەسـاڵاچوو ‹درخـت کهـن: داری دانساڵ›.

**کهن** / kohen/: [عربی] ☜ **کاهن ـ١**

**کهنسال** / kohansāl ، ـان/: *صفت.* دانسـاڵ؛ پـیر؛ کۆنسـاڵ؛ کۆنەسـاڵ؛ کەڤنسـاڵ: ١. کـاڵ؛ بـە تەمەنی زۆرەوه؛ بەساڵاچوو ٢. به تەمەنی زۆرتـر لە ٧٠ ساڵ (لە مرۆڤدا).

**کهنسـالی** / kohansālî/: *اسم.* کـالێنی؛ کـالی؛ دانسالـی؛ پـیری؛ بەسـاڵاچوویی؛ دۆخ یـان چۆنیەتی پیر و زورهان بوون.

**کهنگـی** / kohnegî/: *اسـم.* کۆنـەیی؛ کـۆنی؛ کەونی؛ بەتەمەنی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کۆنه بوون ‹خانه بـوی کهنگـی مـی‌داد: ماڵـەکه بـۆنی کۆنـەیی دەدا›.

**کهنه** / kahane/: [عربی] جمعِ ☜ **کاهِن**

**کهنه** [1] / kohne ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* کۆنە؛ کوانـە: ١. پەڕۆ؛ تیتۆڵ؛ پرژۆڵ؛ پاتـاڵ؛ شـیقاڵ؛ بزگـوڕ؛ ڕیتک؛ لەتە پارچەی بـۆ سـڕینەوەی شـت یـان جێگایەک ‹کهنه‌ای را برداشت و ظرفها را خشک کرد: کۆنەیەکی هەڵگرت و دەفرەکـانی وشـک کـردەوە› ٢. کۆنەی منـداڵ؛ لەتـە پارچەیـەک کـە وەک پۆشکەی منداڵ بە کار دەڕوا ‹داشت کهنه‌ی بچه می‌شست: خەریک بوو کۆنەی منداڵەکەی دەشۆرد›.

**کهنـه** [2]: *صفت.* کـۆن؛ کۆنـە؛ کەڤـن؛ کەیـەن: ١. کـان؛ کـەون؛ کەهـەن؛ کوانـە؛ کـەونارا؛ پێوەندیدار یان سەر بە کاتی پێشوو ‹زخم کهنـه؛ کتاب کهنه: زامی کۆن؛ کتێبی کۆنە› ٢. شڕ؛ شـڕ و وڕ؛ کرووز؛ کۆخار؛ پلەڕوو؛ قەشپای؛ لەکارتە، بـە هۆی تێپەڕینی کات ‹ماشین کهنه: ماشینی کۆنه›.

▣ **کهنه شدن:** کۆن بوون؛ کۆنـە بـوون/ بیـەی: ١. ژەڤ‌کـەتن؛ بـە هـۆی کاربـەری زۆر یـان تێپەڕینی کات، لە کارکەوتن ‹این لباسها دیگـر کهنه شده است: ئـەم جلانـە ئیتـر کۆنـە بـووگن› ٢. لە باوکەوتن؛ قرم و بایەخی خۆ لە دەسـت دان ‹این حرفها و اداها دیگر کهنه شده است: ئـەم قسە و باسانە ئیتر کۆن بوون›.

**کهنه کـردن:** کۆنـەکردن؛ کـۆن‌کـردن؛ کۆنـە کەردەی: ١. داڕزاندن؛ بە هۆی کەڵک‌گرتنی زۆرەوە لەکارتـــەکردن ٢. ئـــەزموونی زۆر هـەبوون ‹ما سالها پیش این کلک‌هـا را کهنـه کرده‌ایم: ئێمه لەمێژه ئەم فێڵ و تەڵەکانەمان کۆنە کردووه›.

**کهنـه‌پرسـت** / kohneparast ، ـها؛ ـان/: *صفت. [مجازی]* کۆنەپەرست؛ کۆن‌پەرست؛ هۆگری داب

و نـەریت و باوەڕگـەلی قـەدیمی. هـەروەها: **کهنەپرستی**

**کهنەشور** / kohnešûr ، ـها:/اسم. کۆنەشۆر؛ ئامێر یان دەسگایەک بۆ شتنی کۆنەی منداڵ.

**کهنـەفـروش** / kohnefurûš ، ـها؛ ـان/:اسم. خرماڵ؛ کۆنەفرۆش؛ کۆنـەورەش؛ کەڤـنەفرۆش؛ کەڤنەگیر؛ وەتراخچی؛ کەسێ کە جلوبـەرگ و ئـامێری کـۆن دەفرۆشـێ ‹ایـن قلمـدان را از یـک کهنەفروش خریدم: ئەم قەڵەمدانەم لە کۆنەفرۆشێک کڕی›.

**کهنە فروشی** / kohnefurûšî/:اسم. کۆنەفرۆشی؛ کۆنەورەشـی؛ خرماڵـی: ١. کـاری فرۆشـتنی پیتەوای کۆن ‹یک وقتی هم کهنەفروشی مـی‌کـردم: سەردەمێکیش کۆنەفرۆشیم دەکـرد› ٢. پیشـەی کۆنەفرۆش ‹کارم کهنەفروشی بود: کارم کۆنەفرۆشی بوو› ٣. /ـها/ دووکانێ کە پیتەوای کۆنـەی تێـدا دەفرۆشن ‹اینها را در یک کهنـەفروشـی پیـدا کـردم: ئەمانەم لە کۆنەفرۆشیەکدا دۆزیەوە›.

**کهنە کار** / kohnekār ، ـها؛ ـان/: صفت. [گفتـاری] کۆنەکار؛ کارئەزموو؛ بە ئەزموونی زۆر لە کارێـک (زۆرتر ناڕەوا) ‹دزد کهنەکـار؛ قماربـاز کهنـەکـار: دزی کۆنەکار؛ قوماربازی کارئەزموو›.

**کهولت** / kohûlat, kuhûlat/: [عربی]اسم. [ادبی] پـیری؛ زورهـانی؛ لەکارتـەیی؛ بەسـاڵاچوویی؛ دانساڵی ‹دوران کهولت: چاخی زورهانی›.

**کهیر** / kahîr/:اسم. لـیر؛ لـیرک؛ لـیرگ؛ هـیر؛ لەپەر؛ نەخۆشی هەستۆکی بە تاقمێ لە خـۆراک یان دەوا، گەسـتنی جـڕ و جانـەوەر، هـەبوونی کرمی کەدوو یان گرفتی ڕۆحی، کە ئەبێتە هۆی بەدیهاتنی زیپکە و لکی سوور لە سەر پێسـت و هاتنە خوریانی.

▣ کهیر زدن: لیرکردن؛ لـیرگ دەردان؛ زیپکـە دەردان.

**کی** / key ، ـها/: ضـمیر. کەی؛ کـەنگێ؛ کـەنگی؛ کدێ؛ کام‌کات؛ کام‌دەم؛ کینگا؛ کەینێ؛ چ دەم؛ چ وەخت؛ وشەی پرسیار لە کـات و سـات ‹کـی آمدی؟: کی رفت؟: کەی هاتی؟ کەنگێ ڕۆیشت؟›.

**کی** / kî ، ـها؛ ـان/: ضمیر. [گفتـاری] کـێ؛ کـێ؛ چ‌کەس؛ چ‌کەسێ؛ وشەی پرسیار لەمـەڕ تاکـە کەسێکەوە ‹کی آمد؟: کێ هات؟›.

**ـ کی** / akî/: پسوند. [گفتاری] ـ یین؛ ـ ینە؛ ـ ئەکی؛ بە شێوەی ‹دروغکی؛ آبکی: درۆیین؛ ئاوەکی›.

**کیابیـا** / kiyābiyā/:اسم. [گفتـاری] بـڕۆ ـ بـڕۆ؛ کەبکەبە و دەبدەبە؛ تەنتەنە و سەنسەنە؛ دۆخـی کەسێک کە هەمیشە کەسانێ لە خزمەتیـدان و هاوڕایی دەکەن ‹این همسایەی مـا آن روزهـا بـرای خودش کیابیایی داشت: ئەم دراوسێیەمان لەو ڕۆژانـەدا بۆ خۆی برۆ ـ برۆیەکی هەبوو›.

**کیاســـت** / kiyāsat/: [عربـی]اسـم. [ادبـی] ١. دەگـەلی؛ هۆشـیاری؛ بیرتیـژی؛ بیرتێـژی؛ زیرەکی ٢. زانایی؛ سەردەرچوویی؛ لێزانی.

**کیالک** / kiyālak ، ـها/:اسم. کیالەک؛ چەشـنێ گوێیژ؛ جۆرێ بلچ.

**کیـان** / kiyān/:اسم. [مجازی، ادبی] ١. [عربی] بنەما؛ بنیاد؛ پایە؛ بنەڕەت؛ بنیـات؛ پێـز؛ بنـڕەخ ‹کیان خانواده: بنـەمای خـا و خێـزان› ٢. [سریانی] سروشت؛ سرووشت.

**کیـانی** / kîyānî/: صـفت. کیـانی؛ کـەیانی؛ پێوەندیدار یان سەر بە کیانیان، سانی پاشایەتی ئەساتیری ئێران ‹تاج کیانی: تاجی کیانی›.

**کیبرد** / kîbord ، ـها/: [انگلیسی]اسم. ١. کیبورد؛ ڕزنی قوپچـەی سـازێک (وەک پیـانۆ) ٢. ☜ **صفحه‌کلید**

**کیپ**[1] / kîp/: صفت. [گفتاری] کپ؛ کیپ؛ مووبـڕ؛ بەبێ مەودا و بۆشایی ‹در شیشه کیپ است: سـەری شووشەکە کپە›. هەروەها: **کیپ بودن؛ کیپ شدن**

**کیـپ**[2]: قید. کـپ؛ کیـپ؛ مووبڕ؛ بـە شـێوەی بێ‌بۆشایی ‹حاج خـانم صـورتش را کیـپ مـی‌بست: حاجی خانم ڕوومەتی کپ دەگرد›. هەروەها: **کیپ کردن**

**کیت** / kît ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. کیت:
١. بەستەیەک کە بڕێک ئامێر و شتی گرنگی بۆ کارێک تێدایە ‹کیت جراحی: کیتی برینکاری› ٢. کۆمەڵێک لە شتانی جیا-جیای ئامێرێک بۆ خستنە یەک و وەکار خستنی ‹کیت رادیو: کیتی ڕادیۆ›.

**کیتین** / kîtîn/: [فرانسوی]/اسم. کیتین؛ ماکی ڕەق و پتەوی توێکڵی مێرووی‌یان و ڕەق‌پێستان و...

**کیخ** / kîx/: اسم. [قدیمی] ڕیپۆق؛ ڕیق؛ پێخ؛ لچ؛ قلمووێچ؛ قەتا؛ کیلک؛ کلمش؛ کڵمیش؛ ڕیخنە؛ چڵکی چاو.

**کید** / keyd/: [عربی]/اسم. [ادبی] ئاوانتە؛ فێڵوفەرەج؛ حیلە و تەشقەلە.

**کیر** / kîr/: اسم. [مستهجن] کیر؛ کێر؛ کر؛ دم؛ چووک؛ سیرەت؛ گون؛ ئەندامی زاوزێی گوهانداری پێگەیشتووی نێرینە، بەتایبەت مرۆڤ کە پێشاو و ئاوی پشتی لێ دێتە دەرەوە.

**کیروندی** / kîrûndî / ☜ **روندی**

**کیس** / kîs ، ـها/: اسم. گنج؛ چرچ؛ لۆچ؛ کۆل؛ چینێکی چکۆلە کە بە هۆی نووشتانەوەی پارچە کاغەز و... بەدی دێت.

**کیست** / kîst ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [پزشکی] کیست؛ کۆمەڵێک تراوی خەست لە ئەندامێکدا بە کیسە ئاسایەک بە دەوریەوە کە دەکرێ سروشتی یان لە نەخۆشی بێ.

**کیسک** / kîsak/: [؟]/اسم. [کالبدشناسی] ساکوول؛ یەکێ لە دوو کیسەی پێکەوە لکاوی گوێی ناوین (ئەوی‌تریان ئەتریکوول) کە سەرچاوەی ئەندامی بیستنە.

**کیسه** / kîse ، ـها/: [از عربی]/اسم. کیسە:
١. توورە؛ ئامێری ناوبۆشی چوارگۆش (لە چەرم، پارچە، نایلۆن و...) بۆ هەڵگرتن و جێبەجێ کردنی شت ‹کیسەی قند: کیسەی قەن؛ کیسەی برنج: کیسەی برینج› ٢. بۆشاییەک لە جەستەی زۆرێک لە بڕبڕەدارانـدا کە توێکڵێکی نەرم گرتوویەتیە بەر و ماکێکیش دەدەڵێنێ ‹کیسەی صفرا: کیسەی زەرداو› ٣. [جانورشناسی] بۆشاییەکی گیرفان‌ئاسا لە ژێر سکی تاقمێ لە گیانەوەرانـدا (وەک کانگۆرۆ) کە تۆل و بێچوویانی تێدا بەخێو دەکەن ٤. [گیاەشناسی] دەسزگایەک وەکوو کیسە لە بن کارگدا کە هەموو گیاکە دادەپۆشێ ٥. [پزشکی] کیست؛ کیسەئاسایەک پڕ لە تراوێکی خەست لە ئەندامێکدا کە دەکرێ سروشتی یان لە نەخۆشی بێ ٦. [مجازی] دزدان؛ جزدان؛ کیفی جێی پارە.

▣ **کیسەی آب:** [کالبدشناسی] پاوڕ؛ ناوەکی‌ترین پەردەی پزدان کە تۆلی دەورە داوە و بەسراوە بە ناوکەوە: **کیسەی آمنیوتیک**

**کیسەی آب گرم:** کیسەی ئاوی گەرم؛ ئامێرێکی لاستێکی کە ئاوی گەرمی تێدەکەن، بۆ گەرم‌کردنەوەی ئەندامێک.

**کیسەی آمنیوتیک** ☜ **کیسەی آب**

**کیسەی بکس:** کیسەی بوکس؛ کیسەیەکی گەورە وەکوو هەرمێ بۆ مستەکۆڵە لێدان.

**کیسەی حمام:** کیسە؛ کیسەی حەمام؛ کیسەیەک لە ماکێکی زبر بۆ شۆردنی لەش.

**کیسەی صفرا:** [کالبدشناسی] کیسەی زەرداو؛ سیکلانۆچکەی زراو؛ توورەکەی زراو.

**کیسەی نایلونی:** دەڵق.

**کیسەی یخ:** کیسەی یەخ؛ ئامێرێ بە شێوەی کیسەیەکی لاستیکی خڕ کە سەهۆڵی تێدەکەن بۆ سارد کردنەوەی ئەندامێک.

▣ **کیسه دوختن برای چیزی** ☜ **جیب دوختن برای چیزی، جیب**

**کیسه کشیدن:** کیسەکێشان؛ شتنی لەش بە کیسەی حەمام ‹آن‌قدر کیسەام می‌کشید که پوست تنم سرخ می‌شد: ئەوندە کیسەی دەکێشام پێستم سوور هەڵدەگەڕا›.

از کیسەی خلیفه بخشیدن: *[کنایی]* لە کیسەی شێخ بەخشین؛ لە ئاوی حەمام تەعارف کردن؛ لە سەر حیسابی کەسێک بە کەسێکی‌تر دان ‹داری خودت بده! چرا از کیسەی خلیفه می‌بخشی؟: ئەگەر هەتە خۆت بیدە! بۆچی لە کیسەی شێخ دەبەخشی؟›.

از کیسه خوردن ☜ از جیب خوردن، **جیب**

از کیسه رفتن ☜ از جیب رفتن، **جیب**

سر کیسه را شل کردن ☜ **سر**[1]

**کیسەای** / kîse'î/: [از عربی] *صفت.* کیسەیی؛ کیسە: ۱. بە کیسە ‹سیمان کیسەای: سیمانی کیسەیی› ۲. ئامادەکراو بە کیسە ‹ماست کیسەای: ماستی کیسە›.

**کیسەجیب** / kîsecîb، ـها/: [از عربی/ عربی] *اسم.* کیسەباخەڵی؛ توورەکەیەکی چکۆلە کە زۆرتر چوارگۆش یان خڕە و لێوارەکانی لە ژێر یان لە سەرەوە دەدروونە دەرگای باخەڵەوە.

**کیسەخواب** / kîsexāb، ـها/: [از عربی/ فارسی] *اسم.* کیسەخەو؛ کیسەخاو: ۱. کیسەیەکی زۆر گەورە لە پارچەی نەدەڵێن و زۆرتر بە زیپەوە و لایەدووری‌کراو کە لە دەشت و کێو، شەوان و کاتی سەرما و سەهۆڵ تێیدا دەخەون ۲. کیسەیەکی زیپدار بۆ جێبەجێ‌کردنی ساوای نووستوو لە دەرەوەی ماڵ.

**کیسەکش** / kîsekeš، ـها/: [از عربی/ فارسی] *اسم.* کیسەکێش؛ ناتر؛ دەلاک؛ کەسێ کە لە حەمامی هەموانیدا لەشی خەڵک دەشوا.

**کیش**[1] / kîš، ـها/: *اسم. [ادبی]* ۱. لـها/ دین؛ ئایین؛ ئائین ‹کیش مسیحیت: دینی خاچپەرستی› ۲. ☜ **شمشاد**

**کیش**[2]: *صوت.* کش: ۱. کیش؛ وشەیەک لە شەترەنجدا کە بۆ دەربڕینی لە مەترسیدا بوونی شای هامباز دەگوترێ ۲. وشەی دەرکردنی پەلەوەر، بەتایبەت باڵندەی ماڵی.

◘ **کیش دادن:** کش دان؛ کش‌کردن؛ لە کایەی شەترەنجدا ڕاگەیاندنی مەترسی بە شای هامباز ‹کیش داد و فیل او را گرفت: کشی دا و فیلەکەی خوارد›.

**کیش شدن:** کش بوون؛ لە کشدا بوون؛ لە مەترسی بوونی شا، لە یاری شەترەنجدا ‹اگر سرباز را بازی کنی، کیش می‌شوی: ئەگەر بە سەربازەکە کایە بکەی، کش دەبی›.

**کیش کردن:** ۱. کش‌کردن؛ کش‌کەردەی؛ دەرکردنی پەلەوەر و باڵندە و میرووی باڵدار ‹برو مرغها را کیش کن!: بڕۆ مریشکەکان کش کە!› ۲. کس دادان؛ کس کەردەونەی؛ وشەیەک بۆ هاندانی سەگ ‹بچەها سگ را به طرف گدای بیچاره کیش می‌کردند: منداڵەکان سەگیان بەرەو دەرۆزە داماوەکە کس دەدا›.

**کیف** / keyf، ـها/: [عربی] *اسم.* ۱. *[گفتاری]* خۆشی؛ وەشی؛ شادی؛ هووت؛ کەیف‌خۆشی ۲. چۆنیەتی؛ چلۆنایەتی؛ چلۆنەتی.

◘ **کیف دادن:** کەیف سازکردن؛ خۆشی پێدان ‹گردش دیروز خیلی به من کیف داد: سەیرانی دوێنێ زۆر کەیفی ساز کردم›.

**کیف داشتن:** بە کەیف بوون؛ خۆش بوون؛ وەش بیەی ‹دیدن کارهای آنها خیلی کیف داشت: بینینی کارەکانیان زۆر بە کەیف بوو›.

**کیف کردن:** کەیف‌کردن؛ خۆش ڕابواردن؛ شەوق‌کردن؛ وەشی/ حەزکەردەی؛ بە خۆشی ڕابواردن ‹نمی‌دانی چه کیفی می‌کرد: نازانی چ کەیفێکی دەکرد›.

**کیف کسی کوک بودن** ☜ کوک بودن کیف کسی، **کوک**[2]

**کیف** / kîf، ـها/: *اسم.* کیف: ۱. ئامێرێکی ناوبۆشی زۆرتر چوارگۆش کە دەکرێتەوە و دەبەسترێ و لە ماکێکی نەدەڵێن (وەک چەرم و بریزینت و...) دروست دەکرێ بۆ تێنانی شتومەکی پێویست و ئامرازی کار ‹کیف مدرسه؛ کیف مهندسی: کیفی قوتابخانە؛ کیفی ئەندازیاری›

۲. وەها شتێک لە ئەندازەی چکۆلەتردا بۆ هەلگرتنی پارە و کارت و بەلگە لە گیرفاندا ‹کیف بغلی: کیفی باخەلی› ٤. جانتا؛ جنتە؛ هەگبە؛ چەنتک؛ چانتە؛ ساک؛ کیسەئاسای دەستەدار بۆ تێنانی کەلپەلی سەفەر یان ئەو شتانەی دەکرێن.

**کیفر** / keyfar ، ـها/: [عربی]/اسم. تۆلە؛ سزیا؛ سزا؛ جزیا؛ قەساس؛ تاوانی کاری خراپە.

**کیف‌ربا** / kîfrobā ، ـها؛ ـیان/:/اسم. کیفدز؛ گیرفان‌بڕ؛ کیف‌بڕ؛ کیسەبڕ؛ کەسێ کە کیفی خەلکی دەڕفێنێ و هەلدێ: **کیف‌قاپ** *[گفتاری]*

**کیف‌ربایی** / kîfrobāyî/:/اسم. کیفدزی؛ کیف‌بڕی؛ کیسەبڕی؛ کار و ڕەهاتی دزینی کیفی دیتران: **کیف‌قاپی** *[گفتاری]*

**کیفرخواست** / keyfarxāst ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. خوازەنامە؛ داوانامە؛ سکالایێ کە دادئەستێن دژ بە تاوانی، بە دادگای دەدا و بە پێی ئەوە خوازیاری جزیا دانی دەبێ.

**کیفری** / keyfarî/: [عربی] *صفت*. سزایی؛ سزیایی؛ جزیایی.

**کیف‌زن** / kîfzan ، ـها/:/اسم. کیفدز؛ گیرفان‌بڕ؛ کیف‌بڕ؛ کیسەبڕ؛ دزێک کە کیفی خەلکی یان شتی ناو کیفەکانیان دەدزێ. هەروەها: **کیف‌زنی**

**کیف‌قاپ** / kîfqāp/: [فارسی/ ترکی] ☜ **کیف‌رُبا**

**کیف‌قاپی** / kîfqāpî/: [فارسی/ ترکی] ☜ **کیف‌رُبایی**

**کیفور** / keyfûr/: [عربی/ فارسی] *صفت. [گفتاری]* خۆش‌کەیف؛ کەیف‌خۆش؛ کەیف‌وەش؛ بەکەیف؛ بەدەماخ؛ دلخۆش؛ سەرخۆش ‹آزاد از اینکە در کنکور قبول شده بود خیلی کیفور بود: ئازاد لەوەی کە لە کونکووردا سەرکەوتووە زۆر خۆش‌کەیف بوو›.

**کیفی** / keyfî/: [عربی] *صفت*. چلۆنی؛ چۆنی؛ پێوەندیدار بە چلۆنایەتی شتێکەوە.

**کیفی** / kîfî/: *صفت*. کیفی: ۱. بە بیچمی کیف ‹ساک کیفی: جەنتەی کیفی› ۲. بە تایبەتمەندی دانان یان جێ بوونەوە لە ناو کیفدا ‹کامپیوتری کیفی: کەمپیوتری کیفی›.

**کیفیات** / keyfîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **کیفیت**

**کیفیت** / keyfîyyat ، ـها؛ کیفیات/: [عربی]/اسم. چۆنیەتی؛ چلۆنایەتی؛ چلۆنیەتی؛ چلۆنەتی: ۱. کتۆیی؛ دارەت؛ دۆخ یان تایبەتمەندی شتێک یان کەسێک ‹کیفیت کار: چۆنیەتی کار› ۲. *[مجازی]* لۆر؛ بار؛ ڕادەی چاکی ‹کیفیت بالا: چونیەتی باش›.

**کیک** / keyk ، ـها/:/اسم. ۱. [انگلیسی] کەیک؛ کەیکە؛ کێک؛ کادە؛ هەر جۆرە نانێکی شیرین کە لە هەویری ئارد، ڕۆن، شەکر، هێلکە، وانیل، جۆشی شیرین و... لە قالبی تەخت و بە بیچم و ئەندازە و تامی جۆراوجۆرەوە دروست دەکرێ ۲. ☜ **کَک** ۳. گلێنە؛ گلار؛ گزینگ؛ کێلکی؛ کەچک؛ کچێنە؛ کێچک؛ کۆڤان؛ گلارەی چاو.

**کیکم** / kîkom ، ـها/:/اسم. کەیکەم؛ کێکم؛ کێکف؛ کەکەو؛ کەکەوی؛ کەیکوو؛ کەڤۆت؛ کەوت؛ داری ساقەتە ئەستووری گەلاپەنجەیی چێو تۆکمە، بە ڕەنگی سووری کال و نیچکەنیچکەوە کە بۆ نازککاری و نەجاری بەبایەخە.

**کیل** / keyl, kîl ، ـها/: [عربی]/اسم. پێوانە؛ پێومان؛ ئامێری هەلسەنگاندنی بارستایی.

**کیلکا** / kîlkā ، ـها/:/اسم. کیلکا؛ ماسی چکۆلەی خۆراکی.

**کیلو** / kîlo, kîlû/: [فرانسوی] ☜ **کیلوگرم**

**کیلوئی** / kîlo'î, kîlû'î/: [فرانسوی] ☜ **کیلویی**

**کیلوس** / kîlûs/: [یونانی]/اسم. *[فیزیولژی]* کیلووس؛ چەوری هەرسکراوی ڕێلەخۆ کە بە شێوەی تراوێکی شیری ڕەنگ لە ڕیخۆلەی چکۆلەوە دەدەلێتە نێو ڕەوتی خوێنەوە.

**کیلوسیکل** / kîlosîkl, kîlû-/: [فرانسوی] ☜ **کیلوهرتس**

**کیلوگرم** / kîlog(e)ram, kîlû-/: [فرانسوی]/اسم.

کیلـۆگرەم؛ یەکـەی سـەرەکی کێشـانە لـە سیستەمی میتریکدا، بەرامبەر بە هەزار (۱۰۰۰) گرەم: **کیلو**

**کیلومتر** / kîlometr, kîlû- ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کیلـۆمیتر؛ یەکـەی درێژایـی لـە سیسـتەمی میتریکدا بەرانبەر بە هەزار (۱۰۰۰) میتر.

◘ **کیلومتر مربع**: کیلۆمیتری چوارگۆش؛ یەکەی رووپـەڕ بەرانبـەر بـە یـەک میلیـۆن (۱۰۰۰,۰۰۰) میتری چوارگۆش.

**کیلومتر مکعب**: کیلۆمیتری چوارپاڵوو؛ یەکەی بارسـتایی بەرانبـەر بـە یـەک ملیـار (۱۰۰۰,۰۰۰,۰۰۰) میتری چوارپاڵوو.

**کیلومترشـمار** / kîlometršomār, kîlûmetr- ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. کیلۆمیترژمار؛ ئامرازی ئەندازەگرتنی ڕادەی خێرایی و مـەودای پێـوراو بە پێی کیلۆمیتر لە ماشێندا.

**کیلووات** / kîlovāt, kîlû- ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کیلۆوات؛ یەکەی هێز بەرانبەر بە ۱۰۰۰ وات.

**کیلوهرتس** / kîloherts, kîlû-/: [فرانسوی]/اسم. کیلۆهیرتز؛ یەکەی فریکانس بەرانبەر بـە هـەزار (۱۰۰۰) هیرتز: **کیلوسیکل**

**کیلـویی**[1] / kîloyî, kîlûyî/: [فرانسـوی] صفت. [کنـایی] کیلـۆیی؛ کێشـانەیی ‹سـاعت کیلـویی: کاتژمێری کیلۆیی›: **کیلوئی**

**کیلویی**[2]: قید. ۱. کیلۆیـەک؛ کیلۆیـێ؛ کیلویـو؛ هەر یـەک کیلـۆ ‹قنـد کیلـویی چنـد است؟: قەنـد کیلۆیی چەندە؟› ۲ بەکیلۆ؛ کیلۆیی؛ بە شـێوەی کیلۆ ‹این ساعتها را کیلویی می‌فروشند: ئەم کاتژمێرانە بەکیلو دەفرۆشن›: **کیلوئی**

**کیموزین** / kîmozîn/: [؟]/اسم. هەوێن؛ ئامیـان؛ ئامێژەن؛ ئامێژە؛ فریشـک؛ شـیلاوک؛ ژیـلاوک؛ ژیلک؛ هوشە؛ شیلاوقە؛ مایەی پەنیر.

**کیمـوس** / kîmûs/: [یونـانی]/اسـم. [فیزیـولژی] کیمـووس؛ هەویرئاسـای زەرد ڕەنگـی نیمچـە هەرساوی گەدە، بریـەتی لـە تێکـەڵاوی ئـەوی خوراوە لەگەڵ ئەسـیدی گـەدەدا کـە دەڕژێتـە ڕیخۆڵەخۆوە

**کیمونو** / kîmono ، ـها/: [فرانسوی از ژاپنـی]/اسـم. کیمۆنۆ؛ جل‌وبەرگی درێژی نـەریتی ژاپـون بـە سەرقۆڵی فش و کەمەربەنـدی پارچەییـەوە کـە وەکوو کراس لەبەری دەکەن.

**کیمیـا** / kîmiyā/: [یونـانی]/اسـم. ۱. کیمیـا؛ ماکێکی خەیاڵی کە هەر کانزایەکی پێ دەبێتـە زێڕ ۲ [مجازی] گەوهەر؛ هـەر شـتێکی نایـاب و زۆر ئازیز ‹این روزها دوست خوب کیمیاست، اما یافت می‌نشود: لەم دەورانە دۆستی باش گەوهـەرە، بـەڵام دەس ناکەوێ›.

**کیمیاگر** / kîmiyāgar ، ـها؛ ـان/: [یونانی/ فارسـی] اسم. کیمیاگەر؛ کەسێ کە بە شوێنی کیمیاوەیـە یان تێدەکۆشێ دروستی بکا.

**کیمیاگری** / kîmiyāgarî/: [یونانی/ فارسـی]/اسـم. کیمیاگەری؛ پیشە یان کاری کیمیاگەر.

**کـین** / kîn/: اسـم. [ادبـی] ۱. قـین؛ قـینی؛ ڕق؛ کین؛ هەیف؛ حـەیف؛ ڕک ۲ تۆڵـە؛ تـۆڵ؛ دۆز؛ وی.

◘ **کـین خواسـتن**: تۆڵـە سـاندنەوە؛ حـەق سەندنەوە/ کردنەوە.

**کین‌توز** / kîntûz/ ☜ **کینه‌توز**

**کین‌توزی** / kîntûzî/ ☜ **کینه‌توزی**

**کینتیک** / kînetîk/: [انگلیسی] ☜ **سینتیک**

**کـین‌خـواهی** / kînxāhî ، ـهـا/: اسم. [ادبـی] تۆڵەسـێنی؛ تۆڵەئەسـتێنی؛ کـار و ڕەوتی تۆڵـە کردنەوە ‹مردم به کین‌خـواهی او برخاسـتند و تخـت و بخت حاکم را برهم زدند: خەڵـک بـۆ تۆڵـەکردنەوەی هەستانەوە و تـەخت و بـەختی میریـان ژێـر و ژوور کرد›.

**کینماتیـــک** / kînemātîk/: [انگلیســـی] ☜ **سینماتیک**

**کینه** / kîne ، ـهـا/: اسم. ڕق؛ ڕک؛ قـین؛ قـینی؛ کـین؛ هـەیف؛ کینـە؛ عـەنت؛ هەسـتی کـۆنی

دوژمنایەتی.

▣ **کینـەی شـتری:** کۆنـەقین؛ ڕقـی زۆر و درێژخایەن.

▣ **کینـه بـه دل گـرفتن:** قـین لـێ‌هەڵـگرتن؛ ڕک هەڵـگرتن؛ غـەرەز گرتنـە دڵ؛ نگـە لـێ‌گـرتن؛ هەسـتی دوژمـنی پەیـدا کـردن ‹از آن روز از مـن کینـه بـه دل گرفـت: لـەو ڕۆژەوە قینی لێ هەلگرتم›.

**کینه کشیدن:** تۆڵـە سـەندنەوە؛ تۆڵـەکردنەوە؛ حەیف هەلانین؛ هـەیف هەڵـێنان/ سـتاندن؛ وێ‌کردنەوە.

**کینەای** / kîne'î/ ☜ **کینەتوز**

**کینەتـوز** / kînetûz ، ـها؛ ـان/: *صفت.* ڕکـوونی؛ ڕککـوو؛ ڕککـین؛ ڕکـن؛ ڕککـۆیی؛ غـەرەزن؛ قین‌لەبەر؛ قین‌لەدڵ؛ قینەون؛ قـین‌لەسـک؛ ڕک لە سک؛ دەخەس؛ ڕک‌لەزگ؛ ڕق‌جوین؛ ڕق لـە سک؛ دەمبەوەبڕ؛ لەبخباز؛ لەنجوو؛ کێنوو؛ بـوغز لـە زگ؛ بەکینـە؛ بـە ڕق؛ نەهێنبـڕ؛ نهێنبـڕ؛ نەهێندڕ؛ نهێنگر؛ بە خـوو و هـۆگرەتی ڕک لـە سک هەڵگرتن: **کینەای** *[گفتاری]*؛ **کین توز** *[ادبی]*

**کینەتـوزی** / kînetûzî ، ـها/: *اسم.* ڕق‌لـەزگی؛ ڕک‌لەدڵـی؛ ڕککـینی؛ دەخەسـی؛ ڕک‌لەسـکی؛ دۆخـی عـەنتین؛ ڕک هەڵـگرتن و دوژمنایـەتی لەگەڵ کەسێک کردن: **کین توزی** *[ادبی]*

**کینەجو** / kînecû ، ـها؛ ـیان/: *صفت.* ڕکـوونی؛ ڕککوو؛ ڕککین؛ ڕق‌جوین؛ ڕق‌لەسک؛ دەبنەوەبڕ؛ هۆگری دژمنایەتی تۆڵەسەندنەوە.

**کینەجویی** / kînecûyî ، ـها/: *اسم.* قـین‌لەدڵـی؛ قینەونی؛ کینەکێشی؛ دۆخی دوژمـنی کـردن و بە دووی تۆڵەکردنەوە بوون.

**کینەکشی** / kînekešî/ ☜ **کینەورزی**

**کینـــەورزی** / kînevarzî ، ـهـــا/: *اســم.* ڕقەبەرایـەتی؛ قینـەونی؛ کـاری قـین‌کێشـان؛ ڕەوتی دوژمنایـەتی کـردن بـە هـۆی هـەبوونی ڕق و قینەوە: **کینەکشی**

**کیوان** / keyvān/ ☜ **زحل**

**کیوسـک** / kiyûsk ، ـها/: [فرانسـوی از ایتالیـایی] *اسم.* هۆلک؛ دەکـە؛ هۆدەیـەک لـە جێگایـەکی هەموانیدا ‹کیوسک تلفـن: کیوسـک روزنامـەفروشی: هولکی تەلەیفوون؛ دەکەی ڕۆژنامەفرۆشی›.

**کیـــوی** / kîvî/: [انگلیسـی از یکـی از زبانهـای پولینزیایی] *اسم.* کیوی: ۱. دارچکێک بـە گـەڵای نەرم و گوڵی شەش‌پەڕ و میوەی هێلکۆکەییەوە ۲. بەری هێلکەئاسای ئەو دارە بە پێستی ناسک و تووکنی ئامـاڵ قـاوەیی و گۆشـتێکی تـرش و شیرینی سەوز ڕەنگەوە ۳. پەلەوەرێکە نافـڕێ و دنـدووکی درێـژ، پـای ئەسـتوور و پـەلی خۆڵەمێشی هەیە، زاگەبەری زیلاندی نوێیە.

**کیهـان** / keyhān/: *اسم.* ۱. جیهـان؛ جـەهان ۲. ئاسمـان؛ دەرەوەی ئەتموسـفیری زەوی و هەرچی کە تێیدایە.

**کیهـــانشـــناخت** / keyhānšenāxt/ ☜ **کیهان‌شناسی**

**کیهـانشناسـی** / keyhānšenāsî/: *اسـم.* جیهـان‌ناسـی؛ زانسـتی لێکۆڵـینەوە و ناسـینی چۆنیەتی بەدیهاتنی دنیـا و ئـەوەی کـە تێدایـە (وەکـوو کاکەشـانەکان، مـاک، وزە و...): **جهان‌شناسی؛ کیهان‌شناخت**

**کیهان‌نـورد** / keyhān.navard ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ۱. کەشوان؛ کەشڤان؛ ئاسمان‌وان؛ کەسێ کە بۆ ئاسمان سەفەر دەکا ۲. ئاسمان‌وانە؛ ماشـینێک کە بۆ سەفەری ئاسمانی دروست‌کراوە.

**کیهـــان‌نـــوردی** / keyhān.navardî/: *اسم.* ئاسمـان‌وانی: ۱. ئاسمـان‌پێـوی؛ کـار و ڕەوتی ڕۆیشـتن بـۆ دەرەوەی ئەتموسـفیری زەوی ۲. کەشـوانی؛ کەشڤـانی؛ بنـەما و شـێوەگـەلی سەبارەت بە ئاسمانوانی.

**کیهانی** / keyhānî/: *صفت.* جیهـانی؛ جـەهانی؛ ئاسمـانی؛ پێوەندیـدار یـان سـەر بـە دنیـاوە ‹سفرهای کیهانی: سەفەری ئاسمانی›.

# گ

**گ** / g/: *حرف.* گ؛ نیشانەی پیتی بیست و شەشەمینی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.
**گ** / ge/: *اسم.* گێ؛ گاف؛ ناوی بیست و شەشەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.
**گائیدن** / gā'îdan/ ☜ **گاییدن**
**گاباردین** / gābārdîn/: [فرانسوی] *اسم.* گاباردین؛ قوماشی تەنراو لە تانی خوری و پۆی پەمۆ یان بەنی دەسکرد بۆ کۆت و شاڵوار و جلی ژنانە.
**گادولینیم** / gādolîn(i)yom/: [انگلیسی] *اسم.* گادولینیۆم؛ توخمی کیمیایی کانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان بە ژمارەی ئەتومی ٦٤ و کێشی ئەتومی ١٥٧,٢٥.
**ـگار** / gār/: *پسوند.* ـگار؛ ـکار؛ ـ یار: ١. ـکەر؛ ـ یەر؛ ـگەر ‹آموزگار؛ خواستگار: ئامۆژگار؛ داواکار›. ٢. خاوەن تایبەتمەندی یان حاڵەتێک ‹ رستگار؛ پرهیزگار: رزگار؛ پارێزکار›.
**گاراژ** / gārāj، ـها/: [فرانسوی] *اسم. [گفتاری]* گاراج؛ گاراژ: ١. شوێنێ زیاتر سەرگیراو لە ماڵدا، بۆ دانانی ماشێن ٢. *[قدیمی]* شوێنی سوار بوون و دابەزین لە ماشینی مسافربەر.
**گاراژدار** / gārājdār، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* گاراژدار؛ خاوەن گاراژ؛ بەرپرسی گاراژ. هەروەها: **گاراژداری**
**گارانتی** / gārāntî/: [فرانسوی] *اسم.* گارانتی؛ دەستەبەرایەتی؛ کار یان بەڵێنی وەئەستۆگرتنی گیر و گرفتی دوای سەندنی کەلوپەل، لە لایەن بەرهەمهێن یان فرۆشیارەوە ‹این یخچال دو سال گارانتی دارد: ئەم یەخچاڵە دوو ساڵ گارانتی لەسەرە›.
**گارد** / gārd، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* پارێزەر؛ گارد: ١. پاسداری چەکدار ٢. دەستەیەکی چەکداری کە پاراستن و چاوەدێری شوێن یان کەسێکیان وە ئەستۆیە ‹گارد ریاست جمهوری: پارێزەری سەرۆک کۆماری›.
▣ **گارد احترام:** گاردی ڕێز؛ دەستەیەکی چەکداری کە لە ڕێوڕەسمی ڕێزنان، بەرەوپیری چوون و ڕوانەکردنی میوانانی دەستە باڵای سیاسیدا ئامادە دەبن.
▣ **گارد گرفتن:** گاردگرتن؛ دۆخی بەرگری وەخۆگرتن و بەرەنگار بوون.
**گاردریل** / gārdreyl، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* پەرژین؛ پەرچین؛ دیوار یان نەردەیەک بۆ بەرگری لە لادان و کەوتنە خوارەوە لە شوێنێک.
**گاردن‌پارتی** / gārdenpārtî، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* جێژنێ کە لە شوێنێکی بەربڵاو و وەک باخێکی گەورەدا وێڕای بەرنامەی کەیف و خۆشی بەڕێوە دەچێ.

**گارسن** / gārson ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. سفرەچی؛ پێشخزمەت؛ پێشخەمەت؛ گارسۆن؛ خزمەتکاری پیاو لە میوانخانە و ڕەستوران: **گارسون**

**گارسون** / gārson/: [فرانسوی] ☜ **گارسُن**

**گارسه** / gārse ، ـها/: [روسی]/اسم. [چاپ، قدیمی] گارسە؛ جابەی چاوـ چاوە کە پیتی چاپی دەستی لە سەری ڕیز دەکرا.

**گارمون** / gārmon ، ـها/: [روسی]/اسم. گارمون؛ سازێکی بادی ڕۆژئاوایی لە چەشنی ئاکاردیئۆن.

**گارو** / gāro/: [؟] ☜ **رگبند**

**گاری**[1] / gārî ، ـها/: [هندی]/اسم. شال؛ چەرخ، عەرەبانە؛ گرۆلە؛ فیتوو؛ فایتوون؛ گاری؛ گاریە؛ پێڕاگوێزێکی چەرخدار بۆ گواستنەوەی بار کە پتر چارەوا دەیکێشێ.

▣ **گاری دستی**: گاری دەسی؛ پێڕاگوێزێکی چەرخدار کە هێزی شان و پێلی مرۆڤ دەکێشێ.

**ـ گاری**[2]: پسوند. ـکاری؛ ـگاری؛ ـ یاری:
١. بەڕێوە بردنی کارێک ‹خواستگاری: داواکاری›
٢. بە دۆخ یان تایبەتمەندیەکەوە ‹رستگاری: ڕزگاری›.

**گاریچی** / gārîčî ، ـها/: [هندی/ ترکی]/اسم. گاریچی؛ گاریەوان؛ فیتوبەر؛ شۆفیری گاری.

**گاز** / gāz/:/اسم. گاز: ١. [فرانسوی] پارچەی نەرم و لە بەن تەنراو بۆ برینپێچان ٢. قەپ؛ قەپە؛ گازە؛ گەزە؛ گەژ؛ گەوز؛ لەق؛ کاری چەقاندنی ددان دە شتێکدا ‹گاز گرفتن: قەپ گرتن› ٣. /ـها/ هەمۆر؛ گازک؛ گزە؛ مەشە؛ پەنگر؛ گۆس؛ ئامرازێکی دوو شاخە بۆ هەڵگرتنی شتێک ٤. /ـها/ [فرانسوی]/[فیزیک/ گاز؛ هەڵم؛ ماکی بێبیچم و بێسنوور ٥. تێکەڵێک لە چەند گاز بەتایبەت میتان و بووتان، کە بۆ سووتانە ٦. /ـها/ [گفتاری] کەرەستەی گازی وەک وەجاخ گاز.

▣ **گاز اشک‌آور**: گازی فرمێسکهێن؛ هەر کام لەو گازانەی لە هەناسەوە دەچێتە ناو خوێن و بە دنە دانی دەماری چاو، فرمێسک بەدی دێنن.

**گاز بی‌اثر** ☜ **گاز نجیب**

**گاز خردل**: گازی خەردەل؛ تراوێکی سووک، چەور، بێڕەنگ و بۆنتیژ (بە بۆنی خەردەل) کە بە خۆیەوە دەبێتە هەڵم و ئەگەر چاو، پێست و بەتایبەت کۆئەندامی هەناسە دان داگرێ، گیاندار تا شەرای مەرگ دەبا.

**گاز خنده‌آور**: گازی ئۆکسیدی نیترۆژن کە لە ددانپزیشکیدا بۆ سڕکردن بە کار دێ.

**گاز سمی**: گازی ژەهراوی؛ هەر کام لەو گازانە کە ژاراوین و لە شەڕدا بە کاری دەبەن (وەک گازی خەردەل، ئارسنیک، گازی دەمار و...).

**گاز طبیعی**: گازی سروشتی؛ گازی ئاسایی؛ تێکەڵاوێک لە چەند هیدرۆکەربون، بەتایبەت میتان و بووتان، کە لە ژێر زەوی و زۆرتر لەگەڵ نەوتدایە.

**گاز عصبی**: گازی دەمار؛ هەر یەکە لەو گازە ژاراویانە کە پێست دەیمژێ و دەمار گۆج دەکا.

**گاز کربنیک** ☜ دیوکسید کربن، **دیوکسید**

**گاز کمیاب** ☜ **گاز نجیب**

**گاز مایع**: گازی تراو؛ گازی تەوش؛ گازێ کە بە پەستاوتن بۆتە تراو.

**گاز مرداب**: گازی زەلکاو؛ میتان.

**گاز نجیب**: گازی نایاب؛ هەر کام لەو توخمانەی دەستە سیفری خشتەکی مەندەلیوف کە بەشێکی بچووک لە کەش پێک دێنن (وەک هلیۆم، نیئۆن، ئارگۆن؛ کریپتۆن، گزێنۆن و ڕادۆن): **گازبی‌اثر؛ گاز کمیاب**

▣ **گاز دادن**: گاز دان؛ پا لە سەر پیداڵی گاز نان بۆ زۆرترکردنەوەی خێرایی ماشین.

**گاز زدن**: قەپ/ گزە گرتن؛ قەپاڵ لێدان؛ قەپاڵ لێگرتن؛ قەپ داگرتن؛ قەپ لێدان؛ قەپنایوە؛ ئەوەقەپنەی؛ لێکردنەوە بە ددان.

گاز گرفتن: قەپ (لێ)گرتن؛ گاز (لێ)گرتن؛ قەپاڵ لێدان؛ قەپ پێدا کردن؛ قەپکەردە پۆرەی؛ گرەوتش؛ گیرتەی؛ پیانوسان؛ گەزتن؛ گەستن؛ گەژتن؛ گەزگرتن؛ گەزین؛ گەژین؛ دووڕێزە ددان لە شتێ (بەتایبەت لەشی گیانەوەرێک) گیر دان ‹دستم را گاز گرفت: قەپی گرت لە دەستم›.

**گازانبر** / gāzambor, gāz'anbor ، ـها/:/اسم. ۱. گاز؛ گازک؛ گاسک؛ مەشە؛ هەمۆر؛ گۆس؛ کەلبەتان؛ ماشەرز؛ ئامرازێکی دوو پەلە بۆ گرتن، گوشار دان، کەندنەوە و بڕینەوەی مێخ و سیم و... ۲. [جانورشناسی] ☜ **قلاب ـ ۳**

**گازانبری** / gāzamborî, gāz'anborî/: صفت. گاسکی؛ کەلبەتانی ‹حملەی گازانبری: هێرشی گاسکی›.

**گازخان** / gāzxān ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. [زمین‌شناسی] گازخان؛ کون و کەلێنی بەر زارکی گڕکانی دامرکاو کە بۆق و گازی گۆگرد، ئەنیدرید کەربۆنیک، ئوکسیژن و نیترۆژنی لێوە هەڵدەچێ.

**گازر** / gāzor ، ـها؛ ـان/: [آرامی]/اسم. [قدیمی] گلارکۆ؛ گازر؛ قەسار؛ جلشۆر؛ جلکشۆر؛ کەسێ کە جلک و کووتاڵی خەڵکی بە پارە دەشۆرد.

**گازری** / gāzerî/: [آرامی]/اسم. جلشۆری؛ گلارکۆیی؛ قەساری؛ گازری؛ کار و پیشەی جلشۆر.

**گازسوز** / gāzsûz ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] صفت. گازسووز؛ گازسووتێن؛ بە تایبەتمەندی سووتاندنی گاز وەک سووتەمەنی.

**گازگرفتگی** / gāzgereftegî/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. گازاژۆیی؛ گازگرتوویی؛ ڕەوتی خنکان بە هۆی گازی ژاراوی بەتایبەت گازی کەربونەوە ‹یک خانوادەی چهار نفری بر اثر گازگرفتگی خفه شدند: بنەماڵەیەکی چوارکەسی بە هۆی گازاژۆییەوە خنکان›.

**گازوئیل** / gāzo'îl/: [فرانسوی]/اسم. گازۆییل؛ گازۆڵ؛ بەرهەمێکی نەوتی بۆ سووتەمەنی موتور کە لە نەوتی سپی کەمبایەخترە.

**گازوئیلی** / gāzo'îlî/: [فرانسوی] صفت. گازۆییلی؛ گازۆلی: ۱. گازۆلاوی؛ گازۆییلاوی؛ گازۆییل پێوەتلاو ۲. گازۆییل سووتێن؛ بە تایبەتمەندی سووتاندنی گازۆییل.

**گازی**[1] / gāzî/: [فرانسوی]/اسم. گازی؛ ڕاسپاردەی دابەشگەی گاز بۆ بەشینەوەی کەپسوولی گاز بە ماڵاندا ‹گازی آمده، کپسول خالی را ببر عوض کن!: گازی هاتووە، کەپسوولە خاڵیەکە ببە، بیگۆڕەوە!›.

**گازی**[2]: صفت. گازی: ۱. سەر بە گاز ‹جنگ‌افزار گازی: جەنگامێری گازی› ۲. گازسووز؛ گازسووتێن؛ کەرەستەیێ کە بە گاز کار دەکا.

**گاس** / gās/: [کردی] قید. [گفتاری] گاهەس؛ گاس؛ گاهەز؛ گاز؛ ڕەنگە؛ ڕەنگا؛ وێدەچێ؛ شایەد؛ شایەتا؛ ئەشێ.

**گاستریت** / gāst(e)rît/: [فرانسوی]/اسم. [پزشکی] گاستریت؛ نەخۆشی ئاییسان و هەوکردنی توێخی ناوەوەی گەدە.

**گاسترین** / gāst(e)rîn/: [فرانسوی]/اسم. [فیزیولوژی] گاسترین؛ هوورمونێ کە لە کاتی ڕۆچوونی خۆراک بۆ گەدە ئەدەلێ و دەبێتە هۆی بەرهەم هاتنی شیلەی گەدە.

**گاف** / gāf/:/اسم. گاف؛ ناوی بیست‌وشەشەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

▣ **گاف کردن**: [گفتاری] پەن دان؛ دەستە گوڵ بە ئاودا دان؛ بەبێ ورد بوونەوە و بە هەڵە قسەیەک لە دەم داکەوتن یان کارێکی نەگونجاو لێ سەر دان.

**گال** / gāl/:/اسم. [فرانسوی] گاڵ؛ نەخۆشیەکی گیرۆی پێستە کە بەتایبەت لە دەست دەدا و زیپکە و خورووی زۆر دێنێ.

**گالاکتوز** / gālāktoz/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] گالاکتوز؛ شەکری شیر؛ شەکرێکی سپی بلۆرینە

که له ئاودا دەتوێتەوە و پێکهێنەری شەکری شیر و برێ گیاییە.

**گالری** / gāleri/: [فرانسوی]/اسم. ١. پیشانگا؛ پیشانگە؛ شوێنی هەڵگرتن و ڕۆنانی بەرهەمی هونەری ‹گالری فرش: پیشانگای مافوورە› ٢. ژێرخان؛ دالانی لە ژێر زەوی.

**گالش** / gāleš, gāloš ، ـها/: [از فرانسوی]/اسم. پاتە؛ پاتێ؛ گالۆش؛ پێلاوێکی لاستیکی کە لە قوڕ و تەڕ و تووشیدا دەیکەنە سەر پێلاوی چەرمیەوە بۆ بەرگری لە تەڕ و قوڕاوی بوونی.

**گالن** / gālen/: [انگلیسی]/اسم. گالین؛ کانەی سروشتی سولفیدی سرپ، بە ڕەنگی ڕەش یان ئاوی بۆرکارەی بریکەدارەوە.

**گالن** / gālon ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. ١. گالۆن؛ گالۆێن: ١. یەکەی دێران بۆ تراو لە وڵاتانی ئینگلیزی زمان بەرامبەر بە ٤،٥٤٥ لیتر (لە ئەمریکا ٣،٧٨٥) ٢. پووت؛ پیت ‹گالن بنزین: گالۆنی بەنزین› ✻ **گالون**

**گالوانومتر** / gālvānometr ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. گالڤانۆمیتر؛ ئامرازێک بۆ دەرخستنی ڕادەی یەکجار کەمی کارەبا و پێوانی تەوژم و لایەنی لە کەرەسەیەکدا.

**گالوانیزه** / gālvānîze/: [فرانسوی]/اسم. گالڤانیزە؛ بە کانزای ڕۆح سواخدراو (زیاتر بۆ ئاسن و پۆلا).

**گالوانیسم** / gālvānîsm/: [فرانسوی]/اسم. گالڤانیزم: ١. ڕەوتی کارەبای وەستاو بەتایبەت کارەبای بەرهەمهاتوو لە کاری کیمیایی ٢. *[پزشکی]* کەلک وەرگری دەرمانی لەو ڕەوتە.

**گالون** / gālon/: [انگلیسی] ☜ **گالن**

**گاله** / gāle ، ـها/:/اسم. ١. گواڵە؛ گالە؛ دنای؛ هور؛ خۆرج؛ خورجە؛ خەرار؛ تێر؛ تێرابی؛ خورجک؛ پاشکۆ؛ خەشە؛ جموەر؛ تیوەرە؛ دوو تای پێکەوە لکاو کە لە دوو بەری چوارپێ یان دووچەرخە و موتورەوە دادەشۆڕێ و بار و تۆشەبەرەی تێدەخرێ.

**گالی** / gālî/:/اسم. لاسکی برینج؛ ساقەتەی برنج.

**گالیک** / gālîk/: [فرانسوی] *صفت.* گالیک؛ فەڕانسی؛ سەر بە فەڕانسە.

**گالیم** / gāl(i)yom/: [فرانسوی]/اسم. گالیۆم؛ توخمی کیمیایی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٣١ و کێشی ئەتومی ٦٩،٧٢ کە وەک زێو بریقەدارە و لە چێکرنی دەماپێوی تایبەت بە تینی زۆر، کەلکی لێدەگرن.

**گالینگور** / gālîngor/: [از روسی/ فرانسوی]/اسم. گالینگور؛ چەرمی دەستکرد بۆ بەرگی کتێب.

**گام** / gām ، ـها/:/اسم. ١. *[ادبی]* هەنگاو؛ هەنگاڤ؛ هەنگەڤ؛ هنگاو؛ هنگاڤ؛ هەنگام؛ لۆق؛ قاو؛ قام؛ پینگاڤ؛ پێنگاڤ؛ پێنگاو؛ پێگاڤ؛ گاف؛ گاڤ؛ گام؛ گاو؛ گۆم؛ گامە؛ شەنگاو؛ شەقام؛ شەقاو؛ شاڤا؛ شاق؛ شاقام؛ شاقاو؛ قەدەم؛ لۆت؛ لاقۆرە؛ لۆقاو ‹آهسته گام برمی‌داشت: هێواش هەنگاوی دەگۆزاوە› ٢. هەنگاو؛ قول؛ قاچ؛ مەودای نێوان دوو لاق لە پا گۆزانەوەیەکدا ‹طول اتاق پنج گام بود: درێژی ژوورەکە پێنج هەنگاو بوو› ٣. [فرانسوی] *[موسیقی]* گام؛ گاف؛ گاو؛ لە شوێن یەک ڕیز بوونی هەشت نۆتی مووسیقا بە شێوەی ئاسایی خۆیان (حەوت نۆت و دووپاتەی نوتی سەرەتایی) ٤. گە؛ مەودای نێوان دوو خاڵی یەکجۆر لە هەر شتێکدا ٥. شەکە؛ کاروانە؛ جووڵە و لەرەی لووتکەی گەمیە یان دووچکەی فڕۆکە.

▣ **گام به گام:** هەنگاو بە هەنگاو؛ بەرە ـ بەرە؛ وردە ـ وردە؛ گاڤانێ؛ قەرەوەقەرەو؛ وەر بە وەر ‹این کار باید گام به گام پیش برود: ئەم کارە دەبێ هەنگاو بە هەنگاو بچێتە پێشەوە›.

▣ **گام برداشتن:** هەنگاو نان/ هەڵگرتن/ هەڵێنان؛ هەنگام/ لاقۆر نیەی؛ پا وارتەیوە/ واڕایوە؛ لۆق هەڵێنان/ هەڵێنانەوە؛ شەقاو نان؛ شەقاو هاویشتن؛ پا گوێزانەوە لە زەوی و بە هەنگاو بەرەو پێش چوون.

**گام نهادن:** پا نان؛ پا نیان؛ چوونە ناو؛ چوونە

نـاوەوە ‹بـە درون اتـاق کـام نهـاد: پـای نایـە نـاو ژوورەکەوە›.

**گاما** / gāmā/: [گاما]/اسم. گاما(γ): ١. سێهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی یوونانی ٢. یەک لە ملیۆنی گرەم ٣. یەکەی تەوژمی میگناتیسی.

**گاماگلبولین** / gāmāgolubûlîn, -gulubûlîn/: [فرانسـوی]/اسـم. گامـاگلوبوولین؛ بەرهــەمی پروتئینی سێرۆمی خوێن کە ماکی بەدیهێنەری دژەویرووس، بەتایبەت هی سووریژەی تێدایە.

**گامبو** / gāmbo, gāmbu، ـها/: صفت. *[گفتاری]* گۆپۆ؛ نەپۆڕ؛ زلهۆڕ؛ زلحۆرت؛ حەپۆل؛ حەپەنتی؛ حنـدرحۆ؛ بم؛ تـەژە؛ زڕتـەزەلام؛ زڕتـەبۆز؛ ترچماق؛ مەندەبوور؛ ترتـرە؛ کەتـە؛ کەلـەگەتی ناقۆلا و نەپۆڕ.

**گامت** / gāmet/: [فرانسوی] ☜ **گانە**[1]

**گـامسـنج** / gāmsanc، ـها/: اسم. هـەنگاوپێو؛ ئامرازێ زۆرتر لە بیچمی کاتژمێر کـە درێژایـی هەنگاو دەپێوێ.

**گان** / gān/: [انگلیسـی]/اسم. گەن؛ بالاپۆشێک لـە پارچـەی ئاونـەدەر بـۆ لەبـەرکردن لـە شـوێنی دژگەنی‌کراو (وەک دیوی برینکاری).

**ـگان** / gān/: پسـوند. ـ ان؛ ـگـەل؛ ـ یـەل؛ ـ یێ؛ نیشانەی پاشگری کۆ بۆ وشەگەلێک کە بـە «ە/ ـــە» نـەخوێنراو تـەواو دەبـن (وەک: گوینـدە ← گویندگان: بێژەر ← بێژەران).

**گانگستر** / gāngester، ـها/: [انگلیسـی]/اسـم. گەنگستر؛ دزی چەکدار؛ هەر کام لـە ئەنـدامانی دەستەیەکی سەربزێوی چەکدار کە کاریان دزی و برینی بانک و فروشگایە.

**گانگستریسم** / gāngesterîsm/: [انگلیسـی]/اسـم. زۆرەملی؛ گانگستریسم؛ شێوەی پـەنا بـردن بـە چەک، هەڕەشە و مرۆکـوژی بـۆ گەیيشـتن بـە ئامانج.

**گـانگلیون** / gāngelyon, gāngliyon، ـها/: [؟] اسم. *[کالبدشناسـی]* گـرێ؛ لـوو ‹گـانگلیون عصبی: گریی دەماری›.

**گانـە**[1] / gāne، ـهـا/: اسم. *[زیسـت‌شناسـی]* گانـە؛ گامیـت؛ تـوخمی جینسـی؛ خانـەی زاوزێـی پێگەیشتوو (نێر یان مێ) کە بە تێکەلاوی لەگەڵ جووتەکەیدا گیانەوەرێکی تـازە بەرهـەم دێنـێ: **گامت**

**ـگانـە**[2]: پسـوند. ١. ـــ انـە؛ ـگانـە: ئاوەڵناوساز ‹دوگانە: دوانە› ٢. ـــکـار؛ ئاوەڵکارسـاز ‹جداگانـە: جیاکار›.

**تێبینی**: لە کوردیـدا پاشـگرێکی پـڕ بـە پـڕی «ـگانە»ی فارسـیمان نیـە، بەڵـکوو لـە جێگـای جۆراجۆردا ـ انە/ ـ وانە/ ـ گانە/ ـ یانـە/ ـکـار و... دەردەکـەوێ، لـە لایـەکی‌تریشـەوە زۆر جـار پاشگری «ـگانە»ی فارسی، بە دووپات بوونـەوە لە کوردیـدا خـۆ نیشـان دەدا، وەکـوو: دوگانـە: دوان ـ دوان/ دوو بە دوو؛ سەگانە: سێ بە سێ.

**گانـەزا** / gānezā/: اسم. ئەنـدامی جنسـی (بـۆ هێلکەگون و هێکدان) کـە گانـەی تێـدا بەرهـەم دێ.

**گانـەزایـی** / gānezāyî/: اسم. *[زیسـت‌شناسـی]* گانەزێیی؛ ڕەوتی وەبەرهاتن و پێکهاتنی گانە لە ئەندامی زاوزێدا.

**ـگانی** / gānî/: پسوند. ١. ـ انی؛ ـ انـە؛ سـەر بـە ئاوەڵناوسـازی گانـە ‹شصـت‌گـانی: شێسـتانی› ٢. ـگانی؛ سەر بە گانی گیانـەوەرانی ‹جورگـانی: جۆرگانی›.

**گـاو**[1] / gāv/: اسم. ١. *[نجـوم]* گـای گـەردوون؛ وێنەیەکی ئاسمانیە: **ثور** ٢. ـها؛ ـان/ *(الف)* گـا؛ گاو؛ گۆ؛ گاوە؛ گاجووت؛ کەڵیا؛ گـای جفـت *ب)* مانگـا؛ مانگـاوە؛ مانگـە؛ چـێڵ؛ چێـر؛ چێلـەک؛ گـاوچێڵ؛ چیپـۆک؛ چوارپـەلێکی گـەورەی دەسەمۆیە کە بۆ شـیر و گۆشـت و پێسـتەکەی بـەخێو دەکـرێ ٣. دووەم سـاڵ لـە تـەقویمی تورکستانی ☜ **تقویم**

**گاو**[2]: صفت. *[مجـازی]* گـا: ١. *[تعـریض]* گـاگێج؛

گاگوو؛ حۆل؛ حەپش؛ گەمژە؛ گەمژەڵ؛ گێل؛ نەفام؛ گەوج؛ بڵح؛ فەحە ۲. *[گفتاری]* زل؛ گەپە؛ کەتە؛ درشت؛ گەورە؛ زەلام.

◙ **گاو بی‌شاخ و دم**: *[مجازی]* گەلهۆ؛ گەلحۆ؛ کەرەزل؛ زەبەلاح؛ زەبلاح؛ گاحۆل؛ حەپۆل؛ حەپۆل مێش‌خۆر؛ حەپەنگ؛ زرتک؛ زل بێ‌هونەر؛ مرۆڤی زلی نەفام.

**گاو ابلق**: ڕێوە؛ ڕیوە؛ گای بەلەک؛ گای بازگ.

**گاو بنه**: بنە؛ مەرس؛ گابنە؛ گای بنە؛ گاوا بنە؛ ئەو گایە کە دەکەوێتە ناوەڕاستی گێرەوە و لە ڕاستە خۆی دەسووڕێ.

**گاو پیشانی سفید**: گای مارۆ: ۱. گایەک سەر تەوێڵ و نێو چاوان سپی کە لە دوورەو دێتە بەر چاو ۲. *[تعریض]* سیمڕۆ؛ مرۆڤی ناسراوی نەک ماقووڵ.

**گاو دریایی**: گای ئاوژی؛ گیانەوەرێکی گەورەی گیاخۆری ئاوژیە.

**گاو کوهی**: ئافوور؛ شڤر؛ نیلەگێژە؛ کەڵە کێوی؛ گای کێوی؛ گاکۆڤی؛ گاکووڤی؛ گا کێوی.

**گاو نه من شیر**: *[مجازی]* مانگای بازگ؛ کەسێ کە ئەگەر سوودی بۆ دیتران ببێ، خۆی خراپی بکا.

◙ **گاو کسی زاییدن**: *[کنایی]* لە کەسێک قەومان؛ قوڕ بە سەری کەسێکدا چوون.

**گاوآهن** / gāvāhan ، ـها/: *اسم.* گاسن؛ گاوەسن؛ گاواسن؛ گاوئاسن؛ گێسن؛ گیسن؛ گیلا؛ هالەت؛ پارچ؛ ئاسنی نوک‌تیژ کە لە دەندەی موور ئەخرێ و زەوی پێ‌دەکێڵن.

**گاوباز** / gāvbāz ، ـها؛ ـان/: *اسم.* گاباز؛ ماتادور؛ کەسێ کە لەگەڵ گادا شەڕ دەکا.

**گاوبازی** / gāvbāzî ، ـها/: *اسم.* گابازی: ۱. شەڕ لەگەل گادا کە لە برێ وڵات بەتایبەت سپانیادا باوە ۲. گاشەڕ؛ جۆرێ کایە و ململانێی خەڵکی گوندنشین کە گا بە گژی یەکدا دەدەن.

**گاوبندی** / gāvbandî/: *اسم.* ۱. جۆرێک بڕیاری نێوان مالک و جووتیار بۆ کشت و کاڵ و بەرهەمی مووچە ۲. *[کنایی]* کەینوبەین؛ خلێنەوبلێنە؛ هاودەستی نێوان دوو یان چەند کەس بۆ دەس پێوەدانی کارێکی نارەوا.

**گاوچاه** / gāvčāh/: *اسم.* ۱. گاچاڵ؛ قولکەی زۆر فرەوان و قووڵ ۲. *[تعریض]* هۆلدان؛ ورگ؛ کادان؛ زگ.

**گاوچران** / gāvčarān ، ـها؛ ـان/: *اسم.* گاوان؛ گاوۆ؛ گاڤان؛ گالو؛ گاوۆن؛ گاچێڕ؛ گادێر؛ گاح؛ گالەوان؛ گا گەلەوان؛ گا چەڕێن؛ گا لەوەڕێن؛ شوانی گاران؛ کەسێ کە لە کەژ و ناو لەوەڕدا لای گا دەگرێ.

**گاوچرانی** / gāvčarānî/: *اسم.* گاوانی؛ گالەوانی؛ گادێری؛ کار و ڕەوتی ڕەشەوڵاخ لەوەڕاندن.

**گاوچشم** / gāvčešm, -čašm ، ـها؛ ـان/: *صفت.* *[مجازی]* چاوگا؛ چاو درشتی نەک جوان.

**گاوداری** / gāvdārî/: *اسم.* گاداری: ۱. کاری ڕاگرتن و بەخێو کردنی گا و مانگا ۲. /ـها/ ڕێکخراوەی تایبەتی ئەو کارە. هەروەها: **گاودار**

**گاودانه** / gāvdāne ، ـها/: *اسم.* مچ؛ کزن؛ گایێنە؛ کلێنە؛ گاگۆز؛ زنگ‌زاوا؛ هورتومان؛ جیدانە؛ گاودانە؛ گادانە؛ گاینە؛ گایانە؛ کرسنە: ۱. گیایەکی تایبەتی ناوچەی مامناوەندی، بە گوڵی بچووک و دەنکی تۆکڵدارەوە کە بۆ ئالیک چاکە ۲. دانەی ئەو گیایە کە ورد و قاوەییە.

**گاودوش** / gāvdûš/: *اسم.* مانگادۆش؛ گادۆش؛ گادۆشکە؛ گادۆشە: ۱. دەفرێکی گەورە کە شیری چێڵی تێ دەدۆشن ۲. شیردۆش؛ کەسێ کە مانگا دەدۆشێ.

**گاورس** / gāvars ، ـها/: *اسم.* کارس؛ گارس؛ گلگل؛ کارسن؛ خورووڤی؛ زوڕات خوروڤی؛ هەرزنەبژار؛ هەرزنەگەورە: ۱. گیایەکی پایا لە تیرەی گەنم بە لقی ژێرخاکی، گەڵای کولکن و گوڵی هێشوویی گرۆڤەرەوە ۲. دەنکی ئەو گیایە

کـه لـه هـەرزن دەچـێ بـەڵام گـەورەترە و تۆکڵەکەی ڕەقترە.

**گاورو** / gāvrow, -ro: /: کـەش؛ کـەش و وەش؛ دۆخێکی زەوینی کشتوکـاڵ کـە تەڕاییەکـەی وایـە بـە پـاوە نانووسـێ و باشـترین کاتـە بـۆ جووت‌کردن.

**گاوزبـان** / gāvzabān ، ـهـا/:/اسم. گـۆزروان؛ گۆزربان؛ گاوەزوان؛ گاوزمان؛ گاوزبـان؛ زمانـەگا؛ گۆگەم؛ گەورز؛ چاورۆگە؛ چەورۆکە:۱. گیایەکی ئالیکی یـەک سـالانە، بـە گـەڵای تـاکی زبـر و کولکن و گوڵی ئاوی و سپیەوە ۲. گولگاوەزوان؛ گوڵی گاوەزوان؛ گوڵی گیـای گـۆزروان کـە بـۆ ڕەوان کردن، عارەق دەردان و میز هێنان بە کار دێ و سوکنایی‌دەرە.

**گاوشیر** / gāvšîr ، ـهـا/:/اسم. وێڵـنگە؛ وێڕینگـە؛ گیایەکی ئالیکی پایا بـە گوڵـی زەرد و شـیلەی بۆنخۆشەوە کە لـە بـەر هـەوادا دەگرسـێ و بـۆ دەرمان و لە عەترسازیدا کەڵکی هەیە.

**گاوصندوق** / gāvsandûq ، ـها/: [فارسی/ معرب] /اسم. قاسـە؛ گاسـنووق؛ گاسـنۆق؛ گاوسـنۆق؛ سندووقی قورس و قایم لە پـۆلا، بـۆ هەڵـگرتنی پارە و بەڵگەی گرینگ.

**گاومرگی** / gāvmargi/:/اسم. دەردەگا؛ گاقـڕان؛ گاقڕ؛ نەخۆشیەکی درمی ئاژەڵ و مەڕ و مالاتـە، گەدەی گیانـەوەر دەئاوسـێ و لیـک لـە دەم و فرمێسک لە چاو و چڵم بە لووتیدا دێتە خـوار و تا دەکا و سکی دەچێ.

**گاومیش** / gāvmîš ، ـها/:/اسم. مەدەک؛ مـاداک؛ مـادەک؛ کـەل؛ گـامێش؛ گـامیش؛ گـۆمێش؛ گـامووش؛ کرتـان؛ کـەر؛ چوارپـەلێکی شـاخ ئەستووری زەلامە لە تیرەی چێڵ بەڵام زلتر.

◙ گاومیش آبی: گامێشی ئاوی؛ گامێشی مالـی وڵاتی هێند.

**گاوه** / gāve/ ☜ **گوه**

**گاه**[1] / gāh/:/اسم. [ادبی] کـات؛ سـات؛ سـا؛ دەم؛ جار؛ وەخت؛ گەهـ ؛ گا؛ گاڤ؛ گاو؛ گۆم؛ عان؛ ناو؛ تاو ‹گاه رفتن: کاتـی ڕۆیشتن›.

**گاه**[2]: قید. جار‌ـجار؛ جارەوبار؛ جاربەجار؛ نـاو بـە ناو؛ گاڤا ‹گاه می‌رود: جار ـ جار دەچێ›.

**ـ گاه**[3]: پسوند. ـگـا: ۱. ـگـە؛ ـگەهـ ‹کشتارگاه: کوژتارگـە› ۲. ـگـاو؛ ـگـەو؛ ـگـار ‹چاشـتگاه: چێشتەنگاو›.

**گاه‌به‌گاه** / gāhbegāh/: قید. جار و بار؛ جـار بـە جـار؛ جارـ جـار؛ جـارە و بـار؛ جـارە و بـارە؛ وەختاوەخت؛ وەخداوەخت؛ وەخت بـە وەخـت؛ نێو بە نێو؛ ناو بە ناو ‹گاه‌به‌گاه اندک بارانی مـی‌بـارد: جار و بار نمەبارانێ دەباری›.

**گاهشماری** / gāhšomārî ، ـها/:/اسم. دەمژمێری؛ کاتژمێری؛ شێوەی پێوان و دابەش‌کردنی کات بە بەشگەلی یەکسان ‹گاهشماری در ایران باستان: دەمژمێری لە ئێرانی کەونارادا›.

**گاهشناسی** / gāhšenāsî ، ـها/:/اسم. کـاتناسـی؛ دەمناسی: ۱. کار و ڕەوتی لێکوڵینەوە و ناسینی کـاتی ڕووداوان ‹گاهشناسـی تـاریخ بـین‌النهـرین: کات‌ناسـی مێـژووی نێوچۆمـان› ۲. کـار و ڕەوتی تۆمـارکردنی ڕووداوان بـە گـوێرەی مێـژوو ‹گاهشناسـی زنـدگی اسـتاد هـژار: دەمناسـی ژیـانی مامۆستا هەژار›.

**گاهگاه** / gāhgāh/: قید. جارجارە؛ جارنان؛ جار و بارە؛ جار و بار؛ جارەوجار؛ جاروەجارێ؛ گاڤگاڤ؛ گا‌ـگا؛ گاگوار؛ گلانگا؛ گەگانە؛ گل‌ـگل؛ گاگایـێ؛ گابەگایی؛ گاڤانی؛ چەل‌چەلە؛ ناوبەناو؛ تاو نا تاو؛ جار نا جار؛ جاربەجارێ؛ جارجـارێ؛ دەمدەمـێ؛ ناوناو؛ ناوناوە؛ بەین‌ـ بەین؛ بەینابەین؛ دەم‌ـدەم؛ وەخت بە وەخت؛ وەختاوەخت ‹گاهگاه می‌آمد و سـاعتی مـی‌نشسـت: جارجـارە دەهـات و سـاتێک دادەنیشت›: **گهگاه**

**گاه‌گدار** / gāhgodār/: قید. [گفتاری] جار و بـارە؛ جار و بار؛ جارجارێ؛ جارەجارەیەک؛ برێ جـار؛ گل‌ـگلێ ‹گاه‌گدار او را می‌دیدم: جار و بارە ئەمدی›.

**گاهگداری**

**گاهگداری** / gāhgodārî/ ☜ **گاهگدار**

**گاهنامه** / gāhnāme ، ـها/:*اسم.* ١. ڕۆژمێر؛ ڕۆژپێو؛ ساڵنامه؛ ساڵپێو؛ تەقویم؛ دەفتەری بە ڕیز تێدا نووسراوی ڕۆژان و دوازده مانگی ساڵ ٢. کتێبێ کە کات و ساتی ڕووداوی مێژوویی تێدا دەنووسن.

**گاهواره** / gāhvāre/ ☜ **گهواره**

**گـاه و بیگـاه** / gāh-o-bîgāh/:*قید. [گفتاری]* جارنەجار؛ جارناجار؛ وەخت و ناوەخت؛ وەخت و بێوەخت؛ تاو نا تاو؛ بە هەڵکەوت و لە کاتی پێش‌بینی نەکراودا ‹گاەوبیگاە می‌بینم کە داری دعوا می‌کنی: جارنەجار دەتبینم خەریکی شەڕی›.

**گاهی** / gāhî/:*قید.* برێجار؛ برێ جاران؛ جار و بارە؛ جار و بار؛ برێو جارا؛ دەمێ جار؛ هێندێ جار ‹گاهی می‌بینمش: برێ‌جار دەیبینم›: **گهی** *[مخفف]*

**گاییدن** / gāyîdan/: *مصدر. متعدی. [مستهجن، گفتاری]* // **گاییدی**: گات؛ **می گایی**: دەگێی؛ **بگا**: بگێ// گان؛ گاین؛ گایین؛ گەی؛ گای؛ ئیلاقە کردن؛ کەردەی؛ جووت بوون لە لایەن گیانداری نێرەوە، بەتایبەت مرۆ: **گائیدن**. هەروەها: **گاییدنی**

■ صفت مفعولی: **گاییده** (گایاو)/ مصدر منفی: **نگاییدن** (نەگان)

**گئز** / ge'ez/: [؟]*اسم.* گئیز؛ لە زمانە سامیەکانی باو لە ئەفریقای ڕۆژهەلات؛ زمانی ئەدەبی ولاتی حەبەشە: **جِعِز**

**گبر** / gabr ، ـها؛ ـان/: [آرامی]*اسم. [تعریض]* گەور؛ گەبر؛ گاور؛ زەردەشتی؛ ئاورپەرست.

**گبه** / gabbe ، ـها/:*اسم.* گەبە؛ جۆرێک بەڕەی لە تاڵی ئەستووری خوری بە نەخش و نیگاری بێگەلاڵەوە بۆ ڕایەخ یان جوانی.

**گپ** / gap/:*اسم.* دەمەتەقێ؛ دەمتەقە؛ گفت‌وگۆ؛ گەپ؛ وتووێژی بەتایبەت دۆستانە.

☐ گپ زدن: دەمەتەقێ کردن؛ گفت‌وگۆکردن؛ ئاخاوتن؛ قسەکردن ‹مدتی گپ می‌زدیم: ماوەیەک دەمەتەقیمان دەکرد›.

**گتر** / getr ، ـها/: [فرانسوی]*اسم.* گیتر؛ زەنگاڵ؛ گەیتەر؛ فیڤ‌پێلاڤ؛ سەر پێلاڤ؛ پارچەی شالوار کە هەڵگەڕاوەتەوە و بە کێش لە دەوری لاق توند بووە.

**گتـو** / geto ، ـها/: [؟]*اسم.* گیتۆ: ١. شوێنی تایبەتی جوولەکە لە ولاتە ڕۆژاواییەکاندا ٢. *[مجازی]* گەڕەکی تەرخان‌کراو بۆ تێدا ژیانی کۆمەڵەیەکی چەوساوە و لە ژێر گوشاری دینی، ئابووری یان سیاسی.

**گت و گنده** / gat-o-gonde/: *صفت. [گفتاری]* زل و زەبەلاح؛ گەپۆ؛ گەپ؛ گەتە؛ زل ‹هیکل گت‌وگندە: لەشی زل و زەبەلاح›.

**گچ** / gač/:*اسم.* گێچ؛ گەچ؛ گیچ: ١. بەردە گێچ؛ سولفاتی کەلیسیومی ئاودار؛ بەردێکی سپی و نەرمی تۆلاش ــ تۆلاشە کە لە بوونە هەڵمی ئاوی خوێدار پەیدا دەبێ و بە نینۆک هەڵدەکرێ ٢. گەردەیەکی سپیە کە لە کولاندنی بەردەگێچ لە کوورەدا بەرهەم دێ و لە بەنایی و نەقاشی ماڵدا کەڵکی لێ‌دەگرن ٣. ـها/ تەباشیر؛ گەچی نووسین.

▣ گچ آماده ☜ **گچ کشته**

گچ پاریس: گەچی شکستەبەندی؛ گێچی سپی کە لە ئاودا دەگرسێ و ڕەق هەڵدێ: **گچ شکستەبندی**

گچ خیاطی: مل؛ گێچی نەرم و سپی کە کراوەتە کوشتە و وشک بۆتەوە و بۆ نووسین و کاری درووماندا بە کەڵک دێ.

گچ زنده: گێچی زیندوو؛ گەچێ کە ئاوی لێ نەکەوتووە.

گچ شکستەبندی ☜ **گچ پاریس**

گچ کشته: کوشتە؛ هەویری گەچێ سپی بە ئاو: **گچ آماده**

◘ گچ گرفتن: ١. گەچ/ گێچ گرتنەوە ‹یک استانبولی گچ بگیر!: ئەسەمۆلیەک گەچ بگرەوە!› ٢. گێچ/ گەچ‌گرتن ‹رویش را گچ بگیر که معلوم نباشد: سەری گێچ بگرە با دیار نەبێ› ٣. لە گێچ‌گرتن؛ گردنە گەچ؛ گەچ‌گرتن ‹پایش را گچ گرفته بودند: لاقیان لە گێچ گرتبوو›.

**گچبری** / gačborî/:اسم. گەچبڕی: ١. هونەر و لێزانی ڕازاندنەوەی دیوار و بن‌میچ بە نەخشی گەچی ‹در گچبری استاد بود: لە گەچبڕیدا وەستا بوو› ٢. ـها/ نەخش و نیگاری بەرز و نزم بە گێچ ‹سقف گچبری زیبایی داشت: میچەکە گەچبڕیەکی جوانی هەبوو›. هەروەها: **گچبُر**

**گچپزی** / gačpazî/:اسم. گەچپێژی: ١. کاری بەرهەمهێنانی گەچ لە بەردی گەچ بە پێژان لە کوورەدا ٢. ـها/ کوورە یان کارگەی گەچ پێژان. هەروەها: **گچپز**

**گچکار** / gačkār ، ـها؛ ـان/:اسم. گەچکار؛ گێچکار؛ سپیکار؛ کەسێ کە کاری سواخ دانی دیوار و بن‌میچە بە گەچ ‹گچکار آوردیم دیوارها را سفید کرد: گەچکارمان هێنا دیوارەکانی سپی کردەوە›.

**گچکاری**/ gačkārî/:اسم. گەچکاری؛ گێچکاری؛ سپی‌کاری؛ کاری دیوار سواخ دان بە گەچ.

**گچی** / gačî/: صفت. گێچی؛ گەچی؛ گەچین: ١. لە گەچ درووس‌کراو ‹مجسمەی گچی: پەیکەری گەچی› ٢. گەچاوی؛ گەچ پێوەتلاو ‹لباست گچی نشود!: جلەکەت گەچی نەبێ!›.

**گدا**[1] / gedā ، ـها؛ ـیان/:اسم. سوالکەر؛ دەرۆزەکەر؛ خواسکەر؛ خوازەلۆک؛ خوازۆک؛ خازۆک؛ خازخازۆک؛ خوازەکار؛ خواستۆخ؛ خۆهەستەگ؛ پارسەک؛ پارساک؛ چاسر؛ گەدا؛ گدا؛ گیایکەر؛ لەتەچین؛ لەتەچن؛ چنک‌ـچنک؛ دەرکۆـدەرکۆ؛ ئەوەی بۆ بەڕێوە چوونی ژیانی، چاوی لە دەستی ئەم و ئەوە.

**گدا**[2]: صفت. گەدا: ١. هەژار؛ نەدار ‹آدم قحطی بود با این گدا ازدواج کردی؟: قاتی کەس بوو مێردت بەم هەژارە کرد› ٢. *[مجازی]* دەست قووچاو؛ خوازەلۆک؛ چاوبرسی.

**گدائی** / gedā'î/ ☜ **گدایی**

**گدابازی** / gedābāzî ، ـها/:اسم. *[گفتاری]* گەدابازی؛ سوالکەربازی؛ دەرۆزەبازی: ١. کار و ڕەوتی دەس پێوەگرتنی لە ڕادە بەدەر لە خەرج کردندا ٢. ڕەفتاری سوالکەرانە (وەک جل و بەرگی شڕۆڵە لە بەرکردن و کڕووزانەوە).

**گداخانه** / gedāxāne ، ـها/:اسم. گەداخانە؛ گیای‌خانە: ١. شوێنی بەخێوکردنی سوالکەران ٢. *[کنایی]* دامەزراوەی ڕووت و بێ‌پووڵ.

**گداختگی** / godāxtegî/:اسم. چۆنیەتی سوور بوونەوە؛ هەلگڕان؛ بەهتین.

**گداختن** / godāxtan/: مصدر. لازم. متعدی. // **گداختی**: توایەوە؛ **می‌گدازی**: دەتوێیەوە؛ **بگداز**: بتوێوە// ◘لازم. ١. تاویانەوە؛ توانەوە؛ تاویایوە؛ بهیتن؛ بەهتین؛ بهتین؛ تاوین؛ خێوران؛ خێورانەوە؛ قژلان؛ قژلان؛ قژلین؛ قەلین؛ حەلین؛ لە بەر تینی گەرما بوونە تراو ٢. سوور هەلگەڕان؛ هەلگڕان؛ سوورەوە بیەی؛ بە هۆی تینی زۆر، سوور بوونەوە ◘متعدی. ٣. نێل دان؛ شاراندن؛ خێوراندنەوە؛ خاراندن؛ قەمراندن؛ هەلاندن؛ تاو دان؛ تین داپنەی؛ زۆر تین پێدان ‹کوره را گداختن: کوورە نێل دان› ٤. تواندنەوە؛ تاواندنەوە؛ تاوانن؛ تاونایوە؛ قژلاندن؛ کردنە ئاو؛ بڤاشتن؛ بڤەشاندن؛ هەلاندن؛ حەلاندن؛ هەلینایش؛ ماشاندن؛ بە تینی زۆر شتێک کردنە تراو.

■ صفت فاعلی: **گدازنده** (تاوێنەوە)/ صفت مفعولی: **گداخته** (توایەوە)/ مصدر منفی: **نگداختن** (نەتاواندنەوە)

**گداخته** / godāxte/: صفت. ١. داخ؛ بەتاو؛ بە تین؛ زۆر گەرم ‹هوای گداخته: هەوای داخ› ٢. تواوە؛ تاویاگەوە؛ تاویاوە؛ قال؛ هەلاندی؛

هەڵقرچاو؛ برە؛ بە حاڵەتی تراو یان هەویری دەرهاتوو بە هۆی کەوتنە بەر تەوژمی گەرماوە ‹آهن گداخته: ئاسنی تواوە›.

**گدار** / godār ، ـها/:*اسم.* بگار؛ بوار؛ ویار؛ وێر؛ بوهۆر؛ بهوور؛ بور؛ دەراو؛ دەراڤ؛ بڤار؛ بەردەباز؛ پردەبار؛ پاگا؛ پاگ؛ ویەردی؛ شوێنی کەمقووڵی چۆم کە لێوە دەپەڕننەوە ‹بالاتر گدار هست از آنجا رد می‌شویم: ژوورەوە بگارە لەوێوە بەردەباز دەکەین›.

**گداز** [1] / godāz/:*اسم.* ١. تاو؛ کار و ڕەوتی تواندنەوە ٢. دۆخ یان چۆنیەتی توانەوە؛ تاویانەوە؛ تاوانەوە.

**ـگداز** [2]: *پیواژە.* ـ هەڵقرچێن؛ ـ تاوێن؛ ـ برژێن ‹جانگداز: گیانهەڵقرچێن›.

**گدازان** / godāzān/: *صفت.* لە تاو و تین؛ لە هەڵقرچان؛ لە بەر تاوی گەرما، سوور هەڵگەڕان و دەروشانەوە.

**گدازه** / godāze ، ـها/:*اسم.* ١. ماکی تواوە کە لە زارکی گڕکانەوە دەپڕشێتە دەر ٢. ناوی ئەو ماکە پاش سارد بوونەوە و گرسان.

**گدامنش** / gedāmaneš/: *صفت.* تۆرتۆرە؛ سەرسواڵکەر؛ سەرسواڵکەرە؛ سەرەسواڵکەر؛ لیفۆک؛ خوازەڵووک؛ خازۆک؛ خازخازۆک؛ خواستۆخ.

**گدایانه** / gedāyāne/: *صفت.* سواڵکەرانە؛ گەدایانە؛ پارسەکانە؛ خازۆکانە؛ نەدارانە؛ هەژارانە؛ وەکوو سواڵکەران ‹سر و وضع گدایانه داشت: سەر و پۆتراکێ سواڵکەرانەی هەبوو›.

**گدایی** / gedāyî/:*اسم.* دەرۆزە؛ پارسەکی؛ گەدایی؛ گەایی؛ جوەدەری؛ سواڵکەری؛ گەشت؛ لەتچینی: ١. کار و ڕەوتی گەداندن؛ چاو لە دەستی ئەم و ئەو بوون بۆ بژیوی ژیان ٢. چلانە؛ سواڵ؛ پارسە؛ کاری سواڵکەر ❋ **گدائی**

▣ **بە گدایی افتادن:** کەوتنە سواڵکەری/ سواڵی/ گەدایی/ پارسەکی ‹وقتی او را گرفتند زن و بچەاش به گدایی افتادند: کاتی گرتیان منداڵەکانی کەوتنە سواڵکەری›. هەروەها: **گدایی کردن**

**گذار** [1] / gozār/:*اسم.* بوار؛ بگار؛ ویار؛ ویەر؛ بوڕ؛ کار و ڕەوتی پەڕینەوە؛ بەردەباز بوون ‹دوران گذار: سەردەمی بوار›: **گذر**

**ـگذار** [2]: *پیواژە.* ـ نەر؛ ـ دانەر؛ ـ ئەرەنیا ‹بنیانگذار: بنیاتنەر›.

**گذاردن** / gozārdan/ ☜ **گذاشتن**

**گذاشتن** / gozāštan/: *مصدر. متعدی. لازم.* // **گذاشتی:** داتنا؛ **می گذاری:** دادەنێی؛ **بگذار:** دانێ // ▫*متعدی.* ١. دانان؛ ڕۆنان؛ دانیان؛ نهان؛ دانین؛ دەینان؛ ئەرەنیەی؛ نیایرە ‹روی میز گذاشتن: لە سەر مێز دانان› ٢. هێلان؛ هێشتن؛ وێڵ کردن؛ ئاسەی؛ ئاستەی؛ ڕێدان؛ ڕا دەی؛ بەرایی دان ‹بگذار برود: بیلە بڕوا› ٣. دانان؛ نیان؛ نان؛ گژگژاندن؛ کردنەوە؛ نانەوە ‹پی گذاشتن: بنەڕەت دانان› ٤. هێشتن؛ هێلان؛ دانان؛ لە بار و دۆخێکدا وێڵ کردن ‹جا گذاشتن: جێ هێشتن› ٥. دانان؛ نیایرە ‹قرار گذاشتن: بەڵێن دانان› ٦. نان؛ دامەزراندن؛ ئەرەمەرزنەی ‹کار گذاشتن: نانە کار› ٧. نان؛ نیایرە ‹به مدرسه گذاشتن: نانە قوتابخانە› ٨. دانان؛ نیایرە؛ شتێک بۆ کارێک مەزاخت کردن ‹پول گذاشتن: پارە دانان› ٩. دانان؛ ئەرەنیەی؛ هێشتن؛ لەمەڕ کەس یان شتێکەوە کارێ کردن ‹برای کسی ارث گذاشتن: بۆ کەسێک میراتی دانان› ١٠. دانان؛ نیایرە؛ ڕاسپاردن ‹نگهبان گذاشتن: چاودێر دانان› ١١. لێنان؛ بۆ چێشت لێنان و چایی دروستکردن نانە سەر ئاور ‹چای گذاشتن: چای لێنان› ١٢. *[گفتاری]* سرەواندن؛ لێدان؛ کوتان ‹چنان گذاشت بیخ گوشم که سرم گیج رفت: وا سرەواندیە کراکەمدا، سەرم گێژ بوو› ١٣. دانان؛ نیایرە؛ بە کەس یان شتێکەوە تایبەت دان ‹این‌ها را برای تو گذاشته بود: ئەمانەی بۆ تۆ دانابوو› ▫*لازم.* ١٤. کردن؛ کەردەی؛ خستن؛ خستنەوە؛

زاوزێکردنی گیانداران ‹بچه گذاشتن؛ تخم گذاشتن: منـاڵ خستنەوە؛ هێلکـە کـردن› ١٥. کـردن؛ کردنـەوە؛ کـەردەی؛ کـەردەیوە ‹لانـه گذاشـتن: هێلانە کردن› ١٦. هێشتنەوە؛ دانـان؛ هێلانـەوە؛ ئاسـتەیوە؛ ئەوەئاسـتەی ‹گیسـو گذاشـتن؛ ریـش گذاشتن: قژ هیشتنەوە؛ ریش دانان› ١٧. هێشـتن؛ هێلان؛ ئاستەی؛ سەبرکردن ‹گذاشتم خوب بجوشد: هیشـتم جـوان بکولـێ› ١٨. نـان؛ نیـان؛ دانـان؛ نیەی؛ نیای؛ ئاسەی؛ تلین؛ کرداری هاوکرد ‹پا گذاشتن؛ جا گذاشـتن؛ دست گذاشـتن: پـا نـان؛ جـێ هیشـتن؛ دەسـت دانـان› ✽ گـذاردن. هـەروەها: **گذاشتنی**

■ صفت مفعولی: **گذاشـته** (دانـراو)/ مصـدر منفـی: **نگذاشتن** (دانەنان)

**گذر**[1] / gozar/: اسم. گـوزەر: ١. [ادبی] تێپـەڕ؛ بووەڕیس؛ بگارە؛ کار و ڕەوتی تێپەڕین ‹گذر عمر: تێپەڕینـی ژیان›: **گذار** ٢. ـها/ دەرباز؛ دەربازگە؛ دەرباس؛ بگارە؛ بوارگە؛ شوێنی پەڕینەوە ٣. ـها/ [قدیمی] شاکووچە؛ کۆڵانی هەراو.

☐ گذر کردن: تێپـەڕین؛ ڕۆیشـتن؛ گوزەریـان؛ ویـەردەی؛ تێپـەڕکردن؛ ڕەد/ ڕەت بـوون ‹از آنجا گذر کردم: لەوێوە تێپەڕیم›.

گذر کسی بـه جـایی افتـادن: ڕێـی کەسـێک کەوتنـە شـوێنێ؛ ڕا کەوتـەی یـاگێوە؛ بـە شوێنێکدا ڕۆیشتن/ چوون ‹دیروز گذرم به بـازار افتاد، مقداری خرید کردم: دوێنێ ڕێم کەوتە بـازار و هێندێک شتم کڕی›.

ـ **گذر**[2]: پیوازه. ـ بوار؛ ـ بگار؛ ـ تێپـەڕ؛ ـ گـوزەر؛ ـ ویار؛ ـ بودار؛ لە چووندا ‹رهگذر؛ زیرگذر؛ زودگذر: ڕێبوار؛ ژێرگوزەر؛ زووتێپەڕ›.

**گـذرا**[1] / gozarā/: صـفت. تێپـەڕ؛ زووتێپـەڕ؛ کەمخایەن؛ کەمهەڵکرد؛ زووڕابرد؛ گوزەرا ‹نگـاه گذرا: سەیرێکی تێپەڕ›: **گذران**

**گذرا**[2]: قید. بەدەم ڕێوە؛ بە ڕێوە؛ بـە سـەر پـاوە ‹گذرا سلامی کرد و رفت: بەدەم ڕیوە سلاوێکی کرد و چوو›.

**گذران**[1] / gozarān/: اسم. ژیان؛ ژیوار؛ گوزەران: ١. چۆناوچۆنی ژیان ‹گذرانمان بد نبـود، همـه چیـز داشـتیم: ژیانمـان خـراپ نـەبوو، هـەموو شـتێکمان هەبوو› ٢. بژیو؛ بژیوی؛ داژیار؛ هەڵکرد؛ وەڵکرد؛ ئەوەی مرۆی پێ دەژی ‹برای گذران زنـدگی لنـگ مانده بود: بۆ بژیوی ژیان دامابوو›.

**گـذران**[2]: صـفت. کـەمخایـەن؛ زووتێپـەڕ؛ کەمهەڵکرد؛ زووڕابرد؛ گوزەرا.

**گذرانـدن** / gozarāndan/: مصـدر. متعـدی. لازم. //**گذرانـدی**: ڕاتبـوارد؛ **مـی گـذرانی**: ڕادەبـوێری؛ **بگذران**: ڕابوێرە // ☐ متعدی. ١. ڕابواردن؛ ڕابـردن؛ ڕابگردن؛ بە سەر بردن؛ گوزەرانـدن؛ گـوزەرانن؛ بگاردن؛ ڕابارتن؛ ڕابوورین ؛ ویاردەی؛ ویارتـەی؛ گوزەرنـەی؛ گوزەرنـای ‹شب را گذرانـدن: شـەو ڕابواردن› ٢. گوزەراندن؛ گـوزەرانن؛ تێپەڕانـدن؛ دانە سەر ‹زندان را گذراندن: بەندیخانـە دانـە سـەر› ٣. پەسەند کردن ‹قانون گذراندن: قانوون پەسـەند کـردن› ٤. تێپەڕانـدن؛ بووهوورانـدن؛ بۆڕانـدن؛ ئەوەپڕنـەی؛ پـڕنایوە؛ هەڵـبواردن؛ ویەرنـەی؛ ویەرنای؛ ڤـەپەڕاندن؛ شـتێک لـە لایەکـەوە بـۆ لایەکی تر بردن ‹از خیابان گذراندن: لـە شـەقامەوە تێپەڕاندن› ☐ لازم. ٥. گوزەراندن؛ ژیان؛ ڕابـردن؛ ڕابگردن؛ ڕابواردن؛ قەرقەداندن؛ ژیوەی؛ ژیـوای؛ ویـاردەی؛ ویارتـەی؛ بـەردەی ‹خـوش گذرانـدن: خـۆش گوزەرانـدن› ✽ **گذرانیـدن**. هـەروەها: **گذراندنی**

■ صفت فاعلی: **گذراننده** (ڕابوێر)/ صـفت مفعـولی: **گذرانـده** (ڕابـوێراو)/ مصـدر منفـی: **نگذرانـدن** (ڕانەبواردن)

**گذرانه** / gozarāne/: اسم. گوزەرانە؛ پیتاکێ کـە بە هۆی تێپەڕینی ماشینێ لە خاکی وڵاتێکـەوە، لێی دەستێنن.

**گذرانیدن** / gozarānîdan/ ☜ **گذراندن**

**گذربان** / gozarbān ، ـها؛ ـان/: اسم. یارمەتیدەر

بەوانەی لە شەقام دەکەنە ئەو بەرەوە و کومەکیان پێویستە (وەک مندالان، بەساڵاچووان یان نابینایان).

**گذرگاه** / gozargāh ، ـهـا/:اسم. بوارگە؛ دەربازگە؛ ڕێوبان؛ ڕێگاوبان؛ ڕێگەوبان؛ ڕەڤگە (بۆ گیانەوەرانی کێوی)؛ گوزەرەنگە؛ ڕێگای تێپەڕین ‹گذرگاه کاروان: بوارگەی قافڵە›.

**گذرنامه** / gozarnāme ، ـهـا/:اسم. گوزەرنامە؛ پاسپورت؛ پەساپۆرت؛ بروانامەی ڕەسمی بۆ ڕۆیشتن بۆ ولاتانی بیانی.

**گذشت** / gozašt ، ـهـا/:اسم. چاوپۆشی؛ گوزەشت؛ چناویەرد؛ ڕەوتی بووردن لە شتێک بەتایبەت لە مافی خۆ.

▣ **گذشت داشتن**: خاوەن گوزەشت/ لێبووردەیی بوون؛ دارا بوونی ژێهاتی یا خووی چاوپۆشی کردن لە مافی خۆ یا هەڵەی دیتران ‹در برابر دوستان باید گذشت داشت: لە حاندی دۆستاندا دەبێ گوزەشتت هەبێ›.

**گذشت کردن**: بەخشین؛ بووردن؛ لادان؛ بگردن؛ چاوپۆشی‌کردن لە شتێ یان بە کەسی‌تر دان ‹آزاد از حق خودش گذشت کرد: ئازاد حەقی خۆی بەخشی›.

**گذشتگان** / gozaštegān/: ضمیر. پێشینان؛ ڕابواردوان؛ ڕابردوان؛ وەرینان؛ کەسانێ کە لە ڕابردوودا ژیاون.

**گذشتن** / gozaštan/: مصدر. لازم. متعدی. // **گذشتی**: ڕاتبرد؛ **می‌گذری**: ڕادەبری؛ **بگذر**: ڕابرە// بووردن؛ بوورین؛ ویەردەی: ◻لازم. ١. ڕابردن؛ ڕۆیشتن؛ تێپەڕین؛ ڕەتبوون؛ بهوردن؛ بوداردن؛ درێژایی ڕێگایەک پێوان ‹هر روز از این کوچه می‌گذشت: هەمو ڕۆژێ لەم کۆڵانەوە ڕادەبرد› ٢. پەڕینەوە؛ تێپەڕین؛ ڕابردن؛ ڕەتبوون؛ لە لایەکەوە بۆ لایەکی‌تر چوون ‹از رودخانه گذشتن: لە چۆم پەڕینەوە› ٣. تێپەڕین؛ ڕابردن؛ ڕابگردن؛ بە سەر چوونی کات ‹گذشتن عمر: تێپەڕینی تەمەن› ٤. ڕابووردن؛ ڕابردن؛ تێپەڕین؛ بە بار و دۆخێکەوە بوون ‹خوش گذشتن: خۆش ڕابووردن› ٥. بەڕێوەچوون؛ دابین بوون؛ ڕابردن؛ گوزەران؛ ‹زندگی‌اش می‌گذشت: ژیانی بەڕیوەدەچوو› ◻ متعدی. ٦. تێپەڕین؛ لە شوێنێ یان شتێکەوە پێشتر چوون ‹از صفحه‌ی پنجاه هم گذشتم: لە پەڕەی پەنجایش تێپەڕیم› ٧. چاو پۆشین؛ گوزەران؛ بەخشینەوە ‹از سود چیزی گذشتن: لە خێری شتێک چاو پوشین› ٨. خۆش بوون؛ بەخشین؛ بواردن؛ بگاردن؛ ویردن ‹از گناه کسی گذشتن: لە تاوانی کەسێک خوش بوون› ٩. *[ادبی]* مردن؛ لە دنیا دەرچوون. هەروەها: **گذشتنی**

■ صفت فاعلی: **گذرنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **گذشته** (ڕابراو)/ مصدر منفی: **نگذشتن** (ڕانەبردن)

**گذشته**[1] / gozašte ، ـها/:اسم. ڕابردوو؛ ڕابردە؛ ڕابوردە؛ ڕابوردوو؛ بوردو؛ بووردە؛ بووری؛ بووراو؛ بگردگ؛ بە سەرچووگ؛ گوزەراو؛ تێپەڕیو؛ ویەردە؛ وێردە؛ ویاردە؛ ڕابووری؛ گوزەشتە؛ زووتە؛ وەرین؛ بەر لەمە؛ چێوەڵ؛ سەراورد؛ سەراوەرد؛ کاتی پێش لە ئێستا ‹در گذشته این خبرها نبود: لە ڕابردوودا شتی وا نەبوو›.

**گذشته**[2]: صفت. ڕابردوو؛ تێپەڕیو؛ گوزەراو؛ ویەردە؛ سەر بە کاتی پێشوو ‹سال گذشته: ساڵی ڕابردوو›.

**گر**[1] / gar ، ـها/: صفت. گەر؛ گەڕوی؛ گڕوێ؛ گەڕۆڵ؛ گەڕەڵ؛ گەڕگ؛ گەڕڵ؛ گڕۆ؛ تووشیاری نەخۆشی گەڕی.

**گر**[2]: حرف. *[مخفف، ادبی]* ئەر؛ هەر؛ ئەگەر.

**ـگر**[3]: پسوند. ١. ـ باز؛ ـکەر؛ ـکار؛ ـ چی؛ ـکر ‹حیله‌گر: فێڵباز› ٢. ـکەر؛ ـگەر؛ کارکەر؛ خەریکی کارێک ‹کارگر: کارکەر› ٣. ـگەر؛ـگێڕ؛ ـوان؛ـڤان؛ پێکهێنەری شتێک ‹آهنگر: ئاسنگەر›.

**گر** / gor/: [از کردی]اسم. *[گفتاری]* گڕ؛ گڕە؛ گڕپە؛ گڵپە؛ کلپە؛ بلێسە؛ کڵ؛ کل؛ شۆڵەی ئاور.

▣ **گر گرفتن**: گڕگرتن/ گردن: ١. گورگرتن؛

کلپە ساندن؛ گڕ تێبەر بوون؛ گێرتەی؛ گڕ بەردەی؛ گڕوەنە کەوتەی ‹بخاری گر گرفت: سۆپەکە گری گرت› ٢. هەستکردن بە گەرمای زۆر ‹از تشنگی گر گرفتم: لە گەرمانا گرم گرت›.

**گرا** / gerā/: [از فرانسوی] *اسم.* گرا؛ ڕێژەی لادان لە باکووری میگناتیسی بە پێی پلەک.

**ـ گرا** / gerā, garā/: *پسوند.* ـــ ئۆگر؛ ـ هۆگر؛ ـخواز؛ ـ واز؛ ـ ئەوگر؛ ـ پرەنگ؛ ـگرۆ؛ ـگرەوە؛ ـگرتوو؛ ـ ڕاهات؛ لایەنگر ‹راستگرا؛ آشوبگرا: ڕاستوگر؛ ئاژاوەخواز›.

**ـ گرائی** / gerā'î, garā'î/ ☜ **ـ گرایی**

**گرائیدن** / gerā'îdan, garā'îdan/ ☜ **گراییدن**

**گراته** / gerāte/: *اسم.* *[گفتاری]* گرفت؛ کۆسپ؛ کۆسپە؛ چەڵەمە؛ تەگەرە؛ بەربەست؛ دارست؛ گەپل؛ لاست؛ گێچەڵ؛ گێچەڵە؛ قۆرت.

▣ **گراته افتادن:** تەگەرە/ قۆرت/ گرفت تێکەوتن؛ تووشی کەند و کۆسپ/ چەڵەمە/ گێچەڵ/ گرفت بوون ‹این روزها مرتب در کارم گراته می‌افتد: ئەم ڕۆژانە لە پەستا کارەکانم قورتی تیدەکەوی›.

**گراته انداختن:** تەگەرە/ قۆرت تێخستن؛ گێچەڵ تاشین؛ گێچەڵەوە تاونەی ‹نمی‌دانم کی در کارم گراته انداخته: نازانم کێ تەگەرەی خستوتە نێو کارمەوە›.

**گراد** / g(e)rād/: [فرانسوی] *اسم.* گراد: ١. پلەک؛ دەرەجە؛ پێومان؛ پێوانە ٢. *[نظامی]* ئەندازەی گۆشەی ئەستوونی و ئاسۆیی نیشان، کە لوولەی چەکی پێ ڕێک دەکرێ ٣. یەکەیەک بۆ پێوانی گۆشە یان کەوان بەرامبەر بە ٠,٠١ گۆشەی °٩٠.

**گرادیان** / gerādyān, g(e)rād(i)yān/: [؟] *اسم.* گرادیان؛ ڕادەی گۆڕانی هۆکارێکی کەشناسی بە پێی مەودا.

**گراز** / gorāz/: *اسم.* ١. ـها؛ ـان/ هەر کام لە گیانەوەرانی تیرەی بەراز (کێوی و ماڵی) ٢. بەراز؛ وراز؛ گورگاز؛ خووگ؛ خوو؛ گاکوڵ؛ گیانەوەرێکی گوانداری گەورە بە گەدەی دووبەشی، جووتێک شفرەی درێژ، خلێنەی پان و پتەو بۆ گیا هارین، قەپۆزی درێژ و قایم و چوار قامک لە هەر پێدا: **خوک وحشی**

▣ **گراز دریایی:** بەرازی دەریایی/ ئاوژی.

**گراز ماده:** دەڕ؛ ماڵۆس؛ ماڵۆس؛ بەرازی مێ.

**گراز نر:** یەکانە؛ ئێکانە؛ تاک؛ بەڵخە؛ بڕە؛ بڕەک؛ نێرەبەراز.

**گرافیت** / g(e)rāfît/: [فرانسوی] *اسم.* گرافیت؛ جۆرێک بلۆری سروشتی کەربون، ڕەش، چەور، نەرم و بریکەدار کە لە تینی زۆردا ناتوێتەوە، درەنگ دەسووتێ، کارەبا ڕادەگۆزێ و لە سەر کاغەزدا شوێنی ڕەش دەخا و لە دروستکردنی میداد و موتوری کارەبادا بە کەڵک دێ.

▣ **گرافیت مداد:** گرافیتی قەڵەم؛ تێکەڵێک لە گرافیت و خاکەسوورە (گڵەجان) کە میدادی لێ دروست دەکەن.

**گرافیتی** / g(e)rāfîtî/: [فرانسوی] *صفت.* گرافیتی؛ لە جنسی گرافیت.

**گرافیست** / g(e)rāfîst، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* گرافیست؛ کەسێ کە بە هێڵ و نووسراوە نەخش و نیگار بەدی دێنێ.

**گرافیک** / g(e)rāfîk/: [فرانسوی] *اسم.* گرافیک: ١. هونەری کێشانی هێڵ و نووسراوە و بەدیهێنانی نەخش لە سەر شتێک بۆ ڕاگەیاندنی پەیامێکی تایبەت ٢. نوانە؛ نموودار.

**گرافیکی** / g(e)rāfîkî/: [فرانسوی] *صفت.* گرافیکی؛ بە بار و دۆخی گرافیکەوە.

**گرام**[1] / g(e)rām/: [از فرانسوی] *اسم.* گرام: ١. گرامافون؛ قەوان؛ قەوانە؛ سنۆقئاوازە؛ سنۆقەوازە ٢. *[زیست‌شناسی]* شێوەیەک بۆ ناسینەوەی گیاندارانی وردیلە بە ڕەنگکردنیان.

**گرام**[2] : (!) *صفت.* خۆشەویست؛ خوەشەویس؛

وەشەویس؛ بەڕێز.

**گرامافن** / g(e)rāmāfon ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. گـرام؛ قـەوان؛ قەوانـە؛ گرامـافون؛ گرامـەفون؛ سـنۆق‌ئـاوازە؛ سـندووق؛ بێـژەک؛ سـندووقی سـترانان؛ دەزگایـەک بـۆ بیسـتنی دەنگـی تۆمارکراو لە سەر پەڕەی مووسیقا.

**گرامر** / g(e)rāmer/: [فرانسوی]/اسم. ڕێزمـان؛ لقێکـی زمانـەوانی کـە لەمـەڕ وشـە و ڕسـتە و چۆناوچۆنی پێکهاتە و ڕیزبەندیانەوە قسە دەکا.

**گرامی** / gerāmî/: صفت. [ادبی] خۆشەویسـت؛ بـەڕێز؛ ئـازیز؛ خوەشـەویس؛ وەشـەویس؛ وەشەسیاو ‹دوست گرامی؛ شنوندگان گرامی: هـاوڕێی خۆشەویست؛ بیسەرانی بەڕێز›.

⊡ **گرامی داشتن/ شمردن**: ڕێـز لێنـان/ گـیران؛ خەمناندن؛ خۆشەویستی خۆ نیشاندان ‹مقدم او را گرامـی داشـتند: لـە هاتنیـان ڕێـز گـیرا›. هەروەها: **گرامی بودن؛ گرامی شدن**

**گرامیداشت** / gerāmîdāšt/: اسم. کـار و ڕەوتی ڕێز لێنان؛ خەمناندن؛ دکرانـدن ‹گرامیداشت روز مادر: ڕێز لێنانـی ڕۆژی دایک›.

**گران** / gerān/: صفت. گـران: ١. بـە نرخێکـی زۆرتر لە نرخی ڕاستەقینەی خۆی ‹قیمت‌ها گران است: نرخـەکان گرانـە› ٢. گرانبـایی؛ بـە نرخـی زۆرەوە ‹قالی گران؛ خانەی گران: قالی گـران؛ مالـی گران› ٣. [ادبی] قورس ‹بـار گـران: بـاری قـورس› ٤. [ادبی] سـەخت؛ دژوار ‹گـران آمـدن: پـێ گـران بوون›.

⊡ **گران آمدن**: پێ گران/ تاڵ/ ناخۆش/ سەخت بوون؛ لە سـەر گـران بـوون؛ سـەخت ئامـەی ونەی ‹این حرف به او گران آمد: ئـەم قسـەیە پـێ گران بوو›.

**گران بودن**: گران بوون؛ بە نرخـی زۆر بـوون؛ گرانبـایی بـوون ‹گوشـت گـران اسـت: گۆشـت گرانە›.

**گران تمام شدن**: گـران نیشـتن: ١. نیشـتنە گـران؛ خـەرجی زۆر هەڵـگرتن؛ گـران تـەواو بوون ‹این خانه برایمان گران تمام شد: ئـەم ماڵـە نیشتە گران بۆمـان› ٢. [مجازی] خـراپ تـەواو بوون ‹این دشمنی برایت گران تمام می‌شود: ئـەم دوژمنەیەت بۆ گران دەبیشی›.

**گران شدن**: گـران بـوون؛ زۆر بـوونی نرخـی شتێک ‹گوشت خیلی گران شده است: گۆشـت یەکجار گران بووە›.

**گران کردن**: گران کـردن؛ زۆرکـردنی نرخـی شتێک ‹برنج را گـران کـردەانـد: برنجیـان گـران کردووە›.

**گرانبار** / gerānbār/: صفت. [ادبی] بـارگـران؛ بـار قورس.

**گرانبها** / gerānbahā /: صفت. گرانبـایی؛ زۆر بـە نرخ؛ گرانبەها؛ گران‌قیمەت: **گران‌قیمت**

**گرانجـان** / gerāncān ، ـان/: صـفت. [ادبـی] زەڕەتـاڵ؛ ڕەزاتـاڵ؛ ڕەزاقـورس؛ خوێنتـاڵ؛ ڕەزاگران؛ زەڕەگران؛ گرانجـان؛ ئێسـک‌قـورس؛ ئێسک‌گران؛ بە گفت و لفت و کردەوەی ناخۆش و تاڵ. هەروەها: **گرانجانی**

**گرانخـواب** / gerānxāb ، ـان/: صـفت. [ادبـی] خەوگران؛ خەوخۆش؛ خەوقورس؛ وەرم قورس.

**گرانروی** / gerānravî/: اسم. گرانڕۆیی؛ ناڕەوانی؛ خەسـتی؛ هەسـی؛ خەسـی؛ هـەس و هۆلـی؛ خەست و خۆلی؛ خۆڕاگری بڕێ تراو لـە ئاسـت خوڕ بوون و بە لێشاو چوون.

**گرانش** / gerāneš/: اسم. ڕاکێشی؛ هێزی بـەرەو خۆ کێشان.

**گرانفـروش** / gerānfurûš ، ـها؛ ـان/: صـفت. گرانجـان؛ پـڕکێش؛ گـران‌فـرۆش؛ گـران‌ورەش ‹فروشندەی گرانفروش: فرۆشیاری گرانجان›.

**گرانفروشـی** / gerānfurûšî/: اسم. گرانجـانی؛ گـران‌فرۆشـی؛ گـران‌ورەشـی؛ کـار و ڕەوتی فرۆشتنی شت‌ومەک بە نرخێکی زۆرتر لە نرخی دیـاریکراو یـان گرانتـر لـە دیکـەی فرۆشـیاران

‹گرانفروشی می‌کرد، کارش نگرفت: گرانجانی ده‌کرد، کاره‌که‌ی نه‌یگرت›.

**گرانقدر** / gerānqadr/: [فارسی/ عربی] *صفت*. ۱. به‌نرخ؛ به‌بایه‌خ؛ گرانبایی ۲. به‌ڕێز؛ هێژا؛ گرانمایه.

**گران‌قیمت** / gerānqeymat, -qîmat/: [فارسی/ عربی] ☜ **گرانبها**

**گرانمایه** / gerānmāye/: *صفت*. هێژا؛ ڕێزدار؛ به‌ڕێز؛ به‌بایه‌خ و خۆشه‌ویست ‹فرزند گرانمایه: ڕۆڵه‌ی هێژا›.

**گرانول** / g(e)rānol/: [فرانسوی]/*اسم*. نیسکه؛ گرانۆل؛ دانه‌ی وردیله‌ی وه‌ک نیسک یان نوقڵ.

**گرانی** / gerānî/: *اسم*. ۱. گرانی؛ چونیه‌تی گران بوون ‹گرانی بیداد می‌کند: گرانیه‌که گاڵه‌ی پێ‌ده‌کا› ۲. هێزی ڕاکێشی زه‌وین یان هه‌ر ته‌نێکی ئاسمانی‌تر: **نیروی جاذبه؛ نیروی ثقل**

**گرانیت** / gerānît/: [فرانسوی]/*اسم*. پازار؛ گرانیت؛ به‌ردی خارا.

**گرانیگاه** / gerānîgāh ، ـها/: *اسم*. [فیزیک] قورساییگه؛ خاڵی قورسایی؛ جه‌رگه‌ی قورسایی؛ خاڵێک له سه‌ر یان نێزیکی هه‌موو ماکێکدا که هه‌ر چی هێزی ڕاکێشی ڕوو ده‌که‌نه ئه‌و ماکه، له‌و خاڵه‌دا یه‌ک ده‌گرنه‌وه.

**گرایش** / gerāyeš, garāyeš ، ـها؛ ـات/: *اسم*. هۆگری؛ هۆگرایه‌تی؛ ئۆگره‌تی؛ ئۆگریه‌تی؛ ڕاهات: ۱. گره‌وشت؛ ئۆگریه‌تی یان نزیکی به شوێن، جێگا یان شتێکه‌وه ‹گرایش چپ: هۆگری به چه‌پ› ۲. حه‌ز؛ هه‌ز؛ هه‌ژ؛ مگێز؛ کار و ڕه‌وتی په‌سه‌ندکردن ‹گرایش به اسلام: هوگری به ئیسلام› ۳. واز ‹تحقیق در گرایش جوانان: لێکۆڵینه‌وه له وازی لاوان› ٤. هه‌واداری و لایه‌نگری ناڕاسته‌وخۆ ‹درباره‌ی میزان گرایش او چیزی نمی‌دانیم: له‌مه‌ڕ چه‌ن و چۆنی هوگرایه‌تی ئه‌وه‌وه شتێک نازانین›.

**ـــ گرایی** / gerāyî, garāyî/: *پسوند*. ـــ وازی؛ ـخوازی؛ ـ ئه‌وگری؛ ـ هۆگری ‹عمل‌گرایی؛ اسلام‌گرایی: کاروازی؛ ئیسلامخوازی›: **ـ گرائی**

**گراییدن** / gerāyîdan, garāyîdan/ ☜ **گرَویدن: گرائیدن**

**گربه** / gorbe ، ـها/: *اسم*. پشیله؛ پشی؛ پشیلێ؛ پشیک؛ پشه؛ پشۆ؛ پۆشه؛ پسک؛ پسنگ؛ پسیک؛ پسپسیک؛ دهلک؛ ختێ؛ ختک؛ کتک؛ کێتک؛ که‌تک؛ کته؛ کت؛ گیانه‌وه‌ری گوانداری بچووک و تووکن، به سه‌ری خڕ، چاوی زل، سمێڵی هه‌ستۆک، گوێی قیت و کلکی درێژه‌وه که له‌مێژه که‌وی ده‌ستی مرۆ بووه.

◫ **گربه‌ی دریایی** ☜ **شنگ رودخانه**

**گربه‌ی عابد**: *[مجازی]* مام ڕێوی؛ شێخ شه‌یتان؛ سۆفیلکه‌ی قوون قوله‌ته‌ین؛ شاشخاپێن؛ ئیمانداری ڕواڵه‌تی.

**گربه‌ی کور**: *[مجازی]* مرۆی سپله؛ مرۆی بێ‌ئه‌مه‌گ؛ مرۆی پێ‌نه‌زان.

**گربه‌ی مرتضی علی**: *[مجازی]* که‌سێکی مه‌رد و ڕه‌ند؛ مرۆی زیت و فێڵباز که قه‌ت خۆی به ده‌سته‌وه نادا.

**گربه‌ی مشک** ☜ **زَباد- ۱**

**گربه‌ی نر**: گورپه؛ گوربه؛ خۆنه؛ گڤر؛ گیڤڕ؛ گێوڕ؛ پشیله‌ی نێر.

**گربه‌ی وحشی**: هووشک؛ گورواسه؛ کتکه کێفی/ کێفیله؛ پشیله کێوی؛ کته‌هه‌ردێ؛ جۆرێک پشیله‌ی گه‌وره و سووری گوێ‌سووک که که‌وی ده‌ستی مرۆ نه‌بووه.

▣ **گربه در انبان داشتن**: *[کنایی، ادبی]* پیلانێک به ده‌سته‌وه بوون؛ شتێک له ژێر سه‌ردا بوون؛ له فکری به کار بردنی فێڵ و فه‌ره‌جێکدا بوون.

**گربه را دم حجله کشتن**: *[کنایی]* چاو ترسێن کردن؛ زووڕنه‌ی؛ هه‌ر له سه‌ره‌تاوه، چه‌ق و سه‌رسه‌خت بوونی خۆ نیشاندان.

**گربه رقصاندن**: *[مجازی]* کایه پێکردن؛ ته‌گه‌ره خستنه به‌ر پای که‌سێک و به‌ڵێن به درۆ دان و سه‌رگه‌ردان کردنی.

گربە زین/ یراق کردن: *[مجازی]* قوڕ بۆ کەسێک شێلان؛ تەشی بۆ کەسێک ڕێستن؛ ئەرکێک بە پێچەوانەی مەیلی خۆ بۆ کەسێک بەڕێوە بردن.

**گربه تیغی** / gorbetîqî/ ☜ **تَشی**

**گربەرو** / gorberû ، ـها/: *اسم.* باریکە ڕێی ژێر حەمام و سارنج بۆ بلاو بوونەوەی تین و بلاوە کردنی شێ.

**گربەشو** / gorbešû/: *اسم. [کنایی، گفتاری]* پشیلەشۆر؛ پشیشۆر؛ کتکشۆر؛ کار و ڕەوتی شۆردنی بە پەلە و سەرسەری ‹یک دقیقه همه را گربەشو کرد و رفت: بە دەقیقەیەک هەمووی پشیلەشۆر کرد و ڕۆیشت›.

▣ **گربەشو کردن**: پشیلەشۆرکردن؛ پشیشۆر کردن؛ کتکشۆرکردن.

**گربەماهی** / gorbemāhî ، ـها؛ ـان/: *اسم.* سەگماسی؛ ماسیەکی بێفەلسی لەش نەرمە، شتێکی وەک سمێڵی لە سەر لێوە و لە ئاوی شیریندایە.

**گرپ** / gorop/: *صوت.* تەپ؛ ترپ؛ ترپە؛ تەپە؛ تلپ؛ تولوپ؛ دەنگی کپی وێککەوتنی شتێک (وەک کەوتنی کتێب لە سەر فەرش).

**گرپ ـ گرپ** / goropgorop/: *صوت.* تەپەتەپ؛ ترپەترپ؛ گرپەگرپ؛ دەنگی لێدانی دوا بە دوای شتێک بە کپی (وەک دەنگی سمی ئەسپ).

**گرتەبرداری** / gartebardārî ، ـها/: *اسم.* ١. کار و ڕەوتی لێگرتنەوەی وێنە یان نیگارەیەک ٢. *[مجازی]* چاولێکەری؛ لاسایی؛ شوێنکەوتنی بەبێ بیرکردنەوە.

**گرجی** / gorcî/: *اسم.* گورجی: ١. ـها؛ ـان/ خەڵکی ناوچەی گورجیستان ٢. هۆزێکی قەفقازی کە زۆربەی خەلکی گورجستان لەوانن ٣. زمان و خەتی ئەو هۆزە.

**گرچە** / garče/: *حرف.* گەرچی؛ ئەگەرچی؛ هەرچەن؛ هەرچەندە؛ هەرچن؛ دەگەڵ ئەوەشدا ‹گرچە من خبر نداشتم: گەرچی من نەمدەزانی›.

**گرد**[1] / gard/: *اسم.* گەرد؛ گەرت؛ گەردە: ١. ئارد؛ نتە؛ بەرهەمی وردی شتی هاڕدراو ٢. پوودر؛ ماکی ئاسیاو کراوی بەتایبەت پیشەسازی، دەرمانی و ئاڕایشی ٣. تۆز؛ تووس؛ توزک؛ پۆتە؛ خوەڵە پۆتە ٤. *[کنایی]* هیرۆیین.

◙ **گرد دندان**: گەردی ددان؛ گەردەی خاوێنکەرەوەی ددان، بریتی لە کەربوناتی کەلسیوم و بۆنخۆشێک.

▣ **گرد انگیختن**: تۆزکردن؛ تۆز دانە با بە هۆی تیژ تێپەڕینەوە.

**گرد پیری بر سر کسی نشستن**: *[مجازی]* تەمی پیری لەسەر کەسێ نیشتن؛ مووی سەر سپیکردن ‹کمکم جوانی گذشت و گرد پیری بر سرم نشست: کەمکەم لاوی تێپەڕی و تەمی پیریم لێ نیشت›.

**گرد گرفتن**: *[مجازی]* خۆڵ لەسەر نیشتن؛ تۆز خواردن؛ خوڵە واردەی؛ خاک خواردن؛ خاک لێنیشتن؛ شتێکی (زیاتر بایەخدار) بەبێکەڵک داکەوتن.

**از گرد راه رسیدن**: *[مجازی]* لە ڕێوە گەیشتن؛ لە ڕێیەو هاتن؛ تازە گەیشتن ‹همین کە از گرد راه رسید، سراغ مادرش را گرفت: هەر لە ڕێوە گەیشت، هەواڵی دایکی پرسی›.

**بە گرد چیزی/ کسی نرسیدن**: *[کنایی]* تۆزی شتێ/ کەسێ نەتەقاندن/ نەشکاندن؛ بە تۆزی شتێک/ قولی کەسێکدا نەگەیشتن ‹تو هرچە سعی کنی بە گرد او هم نمیرسی: تۆ هەرچەندەش هەوڵ بدەی تۆزی ناتەقنی›.

**ـ گرد**[2]: *پیواژە.* ـگێڵ؛ ـگەڕ؛ ـگەرد: ١. بگەڕ؛ ئەوەی کە دەگەڕێ ‹چپگرد؛ راستگرد: چەپگێل؛ ڕاستگیل› ٢. گەشتیار وەکوو پیشە یان خوو ‹جهانگرد: دنیاگەڕ›.

**گرد**[1] / gerd/: *اسم. [موسیقی]* گرد؛ یەکەی کات لە نۆت نووسیندا کە کێشی بەرامبەر بە دوو

سپی و چوار چەنگە.

**گرد**[٢]: *صفت.* گرد؛ گـرِ؛ خـرِ؛ خـرت؛ خـرِ و ڤـر؛ گلۆلی؛ خرەگە؛ بە بیچمێکی وا کە مەودای هەموو خالێک لە سەر پەرانپـەرِی تـا خالـی ناوەنـدی وەکوو یەک بێ: *الف)* جەغزۆکە *ب)* گندۆلـەک؛ تۆپئاسا *ج)* گرۆڤەر؛ گلیل؛ خرِی لوولە ئاسا.

▣ **گـرد آمـدن:** کـۆ بوونـەوە؛ کـۆوە بـوون؛ تێمرۆکان؛ تێوروکان؛ کۆزکردن؛ خرِ بوونـەوە؛ کۆمەڵ بوون؛ گلێر/ کۆوە بیـەی ‹دور میز گـرد امدند: بە دەوری مێزەکەدا کۆ بوونەوە›.

**گرد آوردن:** کۆکردنەوە؛ کۆوەکردن؛ گلێـرەو کردن؛ جەمەوکردن؛ خرِکردنەوە؛ بەرگهاندن؛ گلانـدن؛ نیـایوریـۆ ‹پـول زیـادی گـرد آورد: پارەیەکی زۆری کۆ کردەوە›.

**گرد شدن:** خرتەوە بوون؛ گـرد بوونـەوە؛ خـرِ بوونەوە ‹چشمهایش گرد شد: چاوی خرتەوە بوو›.

**گرد کردن:** *[ریاضی]* سەرِراستکردنەوە؛ راست کردنـەوە؛ رِۆنـدکردن؛ لـە بەشـی بچـووکی ژمارەیەک چاوپۆشیکردن ‹اگر ٣١٣ را بر حسب دەها گـرد کنیم مـی شـود ٣١٠: ئەگـەر ٣١٣ بـە گوێرەی دە سەرِراست بکەینەوە دەبێتە ٣١٠›.

**گـــرد**[٣]: *قیـد.* (بـە) دەور؛ وە گـەرد؛ دەوری؛ گـردایگـرد؛ گـرد و پـەرِی؛ لـە دەور و بـەری شتێکدا؛ لە دەوری شتێکا.

▣ **گـرد چیـزی گشـتن:** بـە دەوری شـتێکدا خولانەوە: ١. گر/ خـول/ سـوورِ خـواردن بـە دەور شـتێکا ‹گـرد اتـاق مـی‌گشـت: بـە دەوری مالەکەدا دەخولایەوە› ٢. *[مجازی، ادبی]* توخنی شتێک کەوتن ‹گرد قمار نگرد!: تـوخنی قومـار مەکەوە!›.

**گرد** / gord ، ـان/: *صفت.[ادبی]* گـورد؛ پالـەوان؛ زۆرداری جەنگەرانی ‹گُرد دلیر: گوردی دلێر›.

**گـرداب** / gerdāb ، ـهـا/: *اسم.* گێـژاو؛ گێجـاو؛ گـەرداو؛ گـرداو؛ گـراداڤ: ١. تـەمباڤ؛ گـەرِ؛ گـەرِەک؛ گێـرک؛ گـەراڤ؛ گێـژاڤ؛ گێژەنگـە؛ گێـژەن؛ گێژینـە؛ گێـژەو؛ گێجیـە؛ گـوری؛ گێژگـــەرداو؛ گێژگـــەردوو؛ تەندوورەژەنـــە؛ تەندوورەزەنە؛ گێژەنگ؛ ئاشەتەندوورە؛ کەنـداڵ؛ شوێنێک لە ئاوێکی زۆر (رِووبـار یـان زەلیـا) کـە ئاوەکەی سوورِ دەخواتەوە ٢. *[مجازی]* رِووشـە؛ وەیشوومە؛ نشووف ‹گرداب بلا: گێژاوی بەلا›.

**گرداگرد** / gerdāgerd/: *اسم.* پەرانپەرِ؛ دۆرمادار؛ دەورانـدەور؛ دەورتـادەور؛ گردایگـرد؛ کشـت و کنار؛ قەراخ- بێچاخ ‹گرداگرد شهر: پەرانپەرِی شار›.

**گردآلود** / gardālûd/: *صفت.* تـۆزاوی؛ تـۆزین؛ گـەرداوی؛ خـۆلاوی؛ وەلـن؛ وەلنـە؛ رِتـامی؛ تۆزاوین؛ بە تۆزەوە تلاو ‹جلد گردآلـود کتـاب را بـا دسـتش پـاک کـرد: بـەرگی تـۆزاوی کتێبەکـەی بـە دەست سرِی›.

**گردالـه** / gerdāle ، ـهـا/: *اسـم.* گردەتـوەنی: ١. *[زمین‌شناسی]* خرِکە بەردی نەختێ گەورە کـە لەگەڵ بەرد و خۆڵی دەوروبەری جیاوازە و دیارە لە شوێنێکی ترەوە هاتووە ٢. *[قدیمی]* ئاور؛ ژیـل؛ ژیڵ؛ زیلەمۆ؛ ژێلەمۆ؛ وردە خەڵـووز کـە خـرِیان دەکردەوە بۆ ژێر قورسی دەبوو.

**گردالـی** / gerdālî/: *صفت.[گفتـاری]* تۆپەڵـە؛ گزموولە؛ گردە؛ خرِە؛ وەک تۆپ خرِ.

**گردان** / gardān/: *صفت.[ادبی]* لەگـەرِ؛ وەگـەرِ؛ لەخول؛ بەسوورِ؛ زڤـری: ١. بـە تایبەتمەنـدی و توانای بـەدەوری خـۆوە گـەرِان ‹حلقـەی گـردان: ئالقەی لەخـول› ٢. *[نامتـداول]* بـە تایبەتمەنـدی گۆرِان ‹روزگار گردان: رِۆژگاری لەگەرِ›.

**گـــردان** / gordān ، ـهــا/: *اسـم.* گـــوردان؛ دەستەیەک چەکدار بریتی لە سێ گورووهان.

**گردانـــدن** / gardāndan/: *مصـــدر. متعـــدی.* // **گرداندی:** گەرِاندت؛ **می گردانی:** دەگەرِێنی؛ **بگردان:** بگەرِێنـە// ١. گەرِانـدن؛ سـوورِاندن؛ سـوورِانن؛ گێلـنەی؛ گێلـنای؛ چەرخنـەی؛ چـەرخنای؛ خولنـەی؛ خولنـایوە؛ گێرِانـدن؛ گێـرِان؛ خـول پێدان؛ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێ تـر بـردن؛ دەور

پێدان ‹گرداندن مهمانان در شهر: گەڕاندنی میوانەکان بە ناو شاردا› ٢. خولاندنەوە؛ سووڕاندن؛ سووڕانن؛ سووڕاندنەوە؛ سووڕاننەوە؛ گێلنەی؛ گێلنای؛ خولنەی؛ خولنایوە؛ گێڕانـدن؛ خول‌پێدان؛ هەڵخولاندن؛ چەرخاندن؛ گێـڕانن؛ زڤراندن؛ بە دەوری شتێکدا بزواندن ‹دور حیاط گرداندن: بە دەوری حەوشەدا خولاندنەوە› ٣. بەڕێوە بردن؛ چەرخاندن؛ سووڕاندنەوە؛ سووڕاننەوە؛ هەڵسووڕاندن ‹گرداندن مجلس: گەڕاندنی کۆڕ› ٤. *[ادبی]* کردن؛ کردنەوە؛ گۆڕانن؛ گۆڕاندن؛ گێڕان؛ بە دۆخێکی‌تر دەرهێنان ‹روزگار ما را بگردان!: ژیانمان خۆش بکە!› ❋ **گردانیدن**. هەروەها: **گرداندنی**

■ صفت فاعلی: **گرداننده** (گەڕێنەر)/ صفت مفعولی: **گردانده** (گەڕێنراو)/ مصدر منفی: **نگرداندن** (نەگەڕاندن)

**گرداننده** / gardānande ، ـها؛ ـگان/:*اسم*. *[مجازی]* بەڕێوەبەر؛ گەڕێنەر ‹گردانندەی مجلس، زن جوانی بود: بەڕێوەبەری کۆڕەکە، ژنێکی جحێڵ بوو›.

**گردانیدن** / gardānîndan/ ☜ **گرداندن**

**گرداور** / gerdāvar/:*اسم*. کۆکەر؛ کۆکەرەوە.

**گرداوری** / gerdāvarî/:*اسم*. کار و ڕەوتی کۆ کردنەوە؛ خڕکردنەوە؛ گلێرکردنەوە؛ گلاندن؛ یەکەونیان؛ لە شوێنێکدا کەڵەکەکردن ‹گرداوری محصول: کۆ کردنەوەی داهات›.

**گردباد** / gerdbād ، ـها/:*اسم*. گێژەڵووکە؛ گێجەلووکە؛ گێجەڵووکە؛ گەردەلوول؛ گەردولوول؛ گەردەلوور؛ زەمەن؛ تەنوورە؛ باهۆز؛ زلان؛ زلون؛ زڤیرک؛ باگێجە؛ باگێژە؛ گێجەبا؛ گێدۆ؛ گێژڵە؛ گێژەڵە؛ گەردەبا؛ گەرووەبا؛ گەردەبل؛ گەرەپێچە؛ چرچەمان؛ گەرەپێچ؛ گرپێچ؛ گژۆلەک؛ وەلەک؛ باگرۆکە؛ باگەڕ؛ بابلیسک؛ بابەلیسک؛ داوەتی جندۆکان؛ داوەتەجنۆکە؛ شایی جندۆکان؛ هۆڵەجنانی؛ کەڵکەڵەچوچان؛ گەچلەگوچان؛ گەرتەچیچان؛

عیوارەش؛ بای بەقەوەتی وا کە سووڕ دەخوا و بەرەو پێش و سەر دەڕوا.

**گردپاش** / gardpāš ، ـها/:*اسم*. گەردپژێن؛ گەردپاش؛ گەردەپاش: ١. کەرەستەیەک بە کونی وردەوە بۆ پژاندنی گەرد ٢. کەرەستەیەک بۆ کردنە تۆز و پژاندنی تەوشێک.

**گردراه** / gerdrāh ، ـها/:*اسم*. پێچ یان لاڕێیەک لە سەر چەن ڕێیان بۆ ئاسان لادان بە لایەکی‌تردا.

**گردسوز** / gerdsûz/:*اسم*. چراغ گردسوز ☜ **چراغ**

**گردش** / gardeš ، ـها/:*اسم*. خول؛ گەڕ؛ گەردش؛ گەردین: ١. گەشت؛ سەیران؛ گەرد و خول؛ گەشت و گێل؛ هەڵفۆنە؛ کار و ڕەوتی ڕۆشتن بۆ سەیران ‹گردش در باغ: گەشت لە باخدا› ٢. گەرد و خول؛ ڕەوتی هەڵسووڕانی شتێک بە ڕێگایەکی دیاریکراودا ‹گردش زمین: خولی زەوین› ٣. کاری گەڕان؛ جێگۆڕکێ کردنی شتێک ‹گردش هوا: گەڕیانی هەوا› ٤. چەرخ و گەڕ؛ ئاڵوگۆڕی بار و دۆخێک بە بار و دۆخێکی‌تر ‹گردش روزگار: چەرخ و گەڕی ڕۆژگار› ٥. کار و ڕەوتی گەڕان؛ بەڕێوە چوون ‹گردش کار: گەڕانی کار›.

▣ **گردش خون**: گەڕانی خوێن؛ چەرخ و گەڕی بێ‌وچانی خوێن لە دڵەوە بە لەشدا و گەڕانەوەی بۆ دڵ.

**گردش علمی**: گەشتی زانستی؛ سەیرانی شوێنێک بە مەبەستی دیتن، ئاشنا بوون و ناسینەوە.

⊡ **گردش دادن**: گەڕاندن؛ گێڕانن؛ گێلنەی؛ خولاندنەوە؛ سووڕاندنەوە ‹ما را در شهر گردش داد: بە نێو شاردا گەڕاندمانی›.

**گردش کردن**: گەڕیان؛ گەڕان؛ گێلەی؛ سوور/ خول خواردن؛ سووڕانەوە؛ خولانەوە؛ گەردش کردن ‹مدتی در شهر گردش کردیم: ماوەیێک بە

شاردا گەراین›.

**گردشگاه / gardešgāh** ، ـها/:اسم. سەیرانگا؛ سەیرانگە؛ سەیرانگەھ ؛ هۆرە؛ جێگەی سەیران لێ‌کردن ‹کوه آبیدر، گردشگاه مردم سنندج است: کێوی ئاویەر، سەیرانگای خەلکی سنەیە›.

**گردشگر / gardešgar** ، ـها؛ ـان/:اسم. گەشتیار؛ گەڕیدە؛ توووریست؛ ئەوەی بۆ گەشت و سەیران سەفەر دەکا ‹در سال گذشته بسیاری گردشگر خارجی از کردستان دیدن کردند: لە سالی ڕابردوودا زۆرێک گەشتیاری بیانی هاتنە سەیری کوردستان›.

**گردشگری / gardešgarî**/:اسم. گەشتیاری؛ گەشت و گێڵ؛ تووریسم: ۱. سەیران؛ کار و ڕەوتی سەفەرکردن بۆ گەشت و گێڵ ۲. کار و لێزانی دانان و هەڵسووڕانی دامەزراوە و ڕاژەگەلی سەر بە ڕاکێشان و گلدانەوە و میوانداری لە گەشتیاران.

**گردکان / gerdakān**/: [از کردی]/[ادبی] ☜ **گردو**

**گردگاه / gord(e)gāh**/:اسم. [قدیمی] ۱. ☜ **تهیگاه** ۲. پۆتەکە؛ پالوو؛ پالۆ؛ بەشێ لە پشتەوەی ئەسپ کە زینی بە سەردا دەدەن.

**گردگیری / gardgîrî**/:اسم. ۱. کاری سڕینەوە؛ تەکاندن؛ لابردنی تۆز و خۆڵ لە سەر دار و دیوار و کەل‌وپەل ‹کتاب‌ها را گردگیری کردم و همه را در قفسه چیدم: کتێبەکانم سڕیەوە و هەمووم لە قەفەسەکەدا چنی› ۲. [مجازی، گفتاری] کار و ڕەهاتی کۆڵنج تەقاندن؛ کوولنج نەرم‌کردن؛ تاشاندن؛ لێکدان؛ نیشتنە مل یەک.

**گردماه / gerdmāh**/:اسم. [قدیمی] مانگی چواردە: ۱. هەلاب؛ هلاب؛ مانگی پڕ ۲. [کنایی] ڕوومەتی جوان.

**گردن / gardan**/:اسم. مل؛ گەردەن؛ گەردن: ۱. هەفک؛ هەستۆ؛ هەستو؛ هستو؛ ئەستۆ؛ ستۆ؛ قەرپک؛ خەن؛ ئەوک؛ بەشێک لە جەستەی گیانداران کە لە نێوان سەر و لەشدایە ۲. ملە؛ ملکە؛ بەشی باریکەڵەی نێوان زارک و سکی دەفر ‹گردن تُنگ: ملکەی تونگ›.

▣ **گردن کج کردن:**[کنایی] مل کز / کەچ کردن؛ لارەمل وەستان؛ دەربڕینی بێ دەسەلاتی و ئاتاجی خۆ ‹من نمی‌توانم بروم پیش مردم گردن کج کنم: من ناتوانم بڕۆم بە لای خەلکەوە مل کز کەم›.

**گردن کسی از مو باریک‌تر بودن:**[تعریض] دەربڕینی چۆک دادان و فەرمانبەری‌کردن.

**گردن کسی را تبر نزدن:**[تعریض] ملی کەسێ کۆتەدار بوون؛ مل ئەستوور بوون.

**گردن کسی را زدن:** سەر/ ملی کەسێ پەڕاندن؛ لە سەری کەسێ دان؛ سەری کەسێ ژێ‌کرن/ بڕین؛ بە کەرەستەیەکی تیژ سەر لە لەشی کەسێک جیا کردنەوە ‹لاووازیه را گردن زدند: سەری لاڤوازیەیان پەڕاند›.

**گردن کسی را گرفتن:**[کنایی] وەمل کەسێ کەوتن؛ ئەستۆی کەسێ‌گرتن؛ هاتنە مل کەسێک ‹خون جوان بی‌گناه آخر گردن او را گرفت و اعدامش کردند: خوێنی لاوی بێ‌تاوان ئاخری ئەستۆی گرتەوە و لە سێدارەیان دا›.

**گردن کشیدن:** مل‌کێشان؛ مل‌کێشاندن؛ سەرکێشان؛ مل‌کێشتەی؛ بۆ دیتنی شتێک سەر و ملی خۆ بەرزەوەکردن ‹گردن کشیدم ببینم چه خبر است: ملم کێشا بزانم چخەبەرە›.

**گردن کلفت کردن:** مل لێ ئەستوورکردن؛ مل قەوی‌کردن؛ بەهێز و قەڵەو بوونەوە ‹خورده و خوابیده همه‌اش گردن کلفت کرده: هەر خواردوویە و خەوتووە و ملی لێ‌ئەستور کردووە›.

**از گردن خود باز کردن:**[کنایی] لە مل خۆ کردنەوە؛ لە کۆڵ خۆکردنەوە؛ لە ئەستۆی خۆ کردنەوە؛ (کارێک) دانە دواوە ‹آن کار را از گردن خود باز کردم: ئەو کارەم لە مل خۆ کردەوە›.

**به گردن کسی انداختن:** کردنە مل کەسێک؛ خستنە گەردەن کەسێ: ۱. ئەنەمل‌کەردەی؛

کەردەینە مل ‹گردنبند را انداخت به گردن عروس: ملوانکەکەی کردە مل بووکەکە› ٢. *[مجازی]* نانە ملی کەسێ؛ خستنە مل/ پای کەسێک؛ کەسێ تاوانبارکردن؛ نیەی ملوو یۆی ‹چرا همەی تقصیرها را به گردن من می‌اندازید؟: بۆچی هەموو کەم و کوورپەیەک ئەنێنە ملی من؟›.

**به گردن کسی حق داشتن:** هەق بە سەر کەسێکەوە بوون؛ لە بەر چاکە و خزمەت بە کەسێک، ئەو کەسە منەتباری خۆ کردن ‹شما به گردن من حق دارید: ئێوە بە سەر منەوە هەقتان هەیە›.

**به گردن کسی گذاشتن:** *[کنایی]* ١. نانە ملی کەسێک؛ مل کەسێک پێوەکردن ‹دزدی را به گردن او گذاشتند: دزیەکەیان نایە ملی ئەو› ٢. کردنە ملی کەسێ؛ بە زۆر پێ کردن ‹همەی کارهای سخت را به گردن من گذاشت: هەموو کارە دژوارەکانی کردە ملی من›.

**به گردن گرفتن:** *[کنایی]* مل پێدا/ پیا کردن؛ بە ئەستۆگرتن ‹به گردن گرفت که یک شب همە را مهمان کند: ملی پێدا کرد شەوێک هەموو داوەت بکا›.

**گردنبند** / gardanband ، ـها/:اسم. ملوانکە؛ ملوانە؛ ملیوانە؛ ملەوانە؛ ملوەن؛ ملوێن؛ ملوەند؛ ملوێنکە؛ ملوێنە؛ ملڤان؛ ملڤانک؛ ملوێنک؛ خەناوک؛ خەناوکە؛ گەردن‌بەند؛ گەردانە؛ گلادە؛ گولوەن؛ دۆدک؛ ڕستک؛ گەردوان؛ گەردەنی؛ قەفلک؛ کەشکۆل (ئی زارۆکان)؛ بەربەن؛ بەندک؛ بەرمۆر؛ ملێنک؛ ڕەوش و خشڵی لە بەرد، کانزای گرانبایی، مرواری، عاج و ... کە بۆ جوانی بە زنجیرەوە لە ملی دەکەن: **گلوبند**

**گردنفراز** / gardanfarāz ، ـان/: صفت. *[ادبی]* ١. سەربەرز؛ سەربڵند؛ سەرفەراز؛ سەرفیراز ٢. سەربزێو؛ سەرکەش؛ چەڵەک؛ یاغی ٣. قوڵم؛ خۆهەڵکێش؛ قەپان؛ گەوەزە؛ لووت‌بەرز؛ لە خۆ بایی. هەروەها: **گردنفرازی**

**گردنکش** / gardankeš ، ـها؛ ـان/: صفت. *[مجازی]* سەرزەیە؛ سەربزێو؛ سەرپێچ؛ سەرکەش؛ چەڵەک؛ یاغی.

**گردنکشی** / gardankešî ، ـها/:اسم. سەربزێوی؛ سەرپێچی؛ نافەرمانی ‹اگر گردنکشی کرد بیندازش بیرون: ئەگەر سەربزێوی کرد دەری بکە›.

**گردن کلفت** / gardankoloft ، ـها؛ ـان/: صفت. ١. *[کنایی]* مل‌قەوی؛ ملهۆڕ؛ مل‌پان؛ خرتی؛ خرتێ؛ دومل؛ مل‌ئەستوور؛ مل‌ستوور؛ هەفک‌ئەستوور؛ پاتک‌پان؛ خووگەملە؛ خەریت؛ خپشەملە؛ قەبەدای؛ کۆتەک؛ گنێخە؛ ملوڕ؛ گامل؛ گێزمل؛ زۆرداری زۆربێژ ‹مرد گردن‌کلفت: پیاوی ملهور› ٢. *[مجازی]* دەسەڵاتدار؛ دەسچوو؛ دەسچووگ؛ دەسڕۆیو ‹تاجر گردن‌کلفت: تاجری دەسەڵاتدار›.

**گردن کلفتی** / gardankoloftî ، ـها/:اسم. *[کنایی، گفتاری]* ملهوڕی؛ زۆربێژی؛ زۆرداری ‹خواست گردن‌کلفتی بکند آزاد دادش دست پُلیس: ویستی ملهوری بکا ئازاد دایە دەستی پولیسەوە›.

**گردنگاه** / gardangāh/:اسم. جێ مل؛ جێگەی مل لە نێوان هەر دوو شاندا.

**گردنه** / gardane ، ـها/:اسم. کەل؛ سەرملە؛ ملەگا؛ ملە؛ مل؛ گەردەنە؛ گەردنە؛ گیر؛ گەروو؛ گەڵوو؛ گەلوو؛ بستوو؛ زینوو؛ زینو؛ ڕێگای لێژ و پێچەڵپێچ لە پاڵداوێن تا سەر یالی کێو ‹گردنەی خان: کەلی خان›.

**گردنه‌گیر** / gardanegîr ، ـها؛ ـان/:اسم. ١. سەرملەگیر؛ دزی سەرگەردەنە ٢. *[کنایی]* چەتە؛ ڕێگر؛ کەسێ کە بۆ تالان‌کردنی ڕێبواران سەرڕێیان پێ دەگرێ.

**گردو** / gerdû ، ـها/:اسم. گوێز؛ گوویز؛ گۆز؛ گێز؛ گووز؛ قۆز؛ گیز؛ جەوز؛ جۆز؛ جیز؛ گردەکان؛ گرتەکان؛ وەز؛ وەزی؛ گردەکۆ؛ گۆزەک: ١. دارگوێز؛ دارێکی بەرزی پڕ لەق و پۆی گەڵا پان کە چێوێکی ڕەق و تۆکمەی هەیە و لە

پیشەسازیدا بەنرخە ٢. کاکڵە؛ کاکڵی؛ مەژگە؛ بەری خڕیلە و تویکڵ ڕەقی ئەو دارە کە مێشکەکەی چەورە و دەخورێ: **گردکان**

**گردوبازی** / gerdûbāzî/: *اسم.* گوێزان؛ گوویزان؛ گوێزێن؛ وەزەقالانی؛ وەزانی؛ کایەی بە گوێز؛ کایەیەکی چەن‌کەسە، کە هەر کەسێ گوێزێک دادەنێ و بە نۆرە گوێزی بۆ دەخەن، هەرکەس بیانگێوێ گوێزەکان هەڵدەگرێتەوە.

**گرد و خاک** / gard-o-xāk/: *اسم.* تۆز و خۆڵ؛ خاک و خۆڵ؛ خاک‌خوەڵ؛ گەرد و خۆڵ؛ گەرت و توس؛ تەپ و تۆز؛ تەپ و توومان؛ باوبژ؛ وەلل؛ هەڕووەل؛ سۆنک؛ تۆز و غومار؛ خاک‌تووس؛ دەنکە وردیلەی بەتایبەت خاک لە هەوادا: **گرد و غبار**

▣ **گرد و خاک کردن:** تەپ و تۆزکردن؛ تۆز کردن: ١. تۆز و خۆڵ بەرپاکردن؛ گەردەلوول کردن ‹چرا این‌قدر گرد و خاک می‌کنی؟ یواش جارو کن!: بۆچی ئەوندە تەپ و تۆز ئەکەی؟ هێواش گەسک بدە!› ٢. *[کنایی]* هەڵچوون و هەرا و هوریا کردن ‹نمی‌دانی آرام امروز چه گرد و خاکی کرد!: نازانی ئارام ئەمڕۆ چ تەپ و تۆزێکی کرد!›.

**گردوخاکی** / gard-o-xākî/: *صفت.* تۆزاوی؛ خۆڵاوی؛ ڕتامی؛ تۆزین ‹با سر و صورت گردوخاکی برگشت: بە سەر و چاوی تۆزاویەوە گەڕاوە›.

**گردون** / gardûn/: *اسم. [قدیمی]* گەردوون؛ چەرخ؛ ئامان؛ فەلەک؛ ئاسمان.

**گردونه** / gardûne ، ـها/: *اسم.* گەردوونە: ١. *[قدیمی]* هەڕابە؛ گاری؛ پێڕاگوێزێکی سووکەڵەی دووچەرخ کە ئەسپ دەیکێشێ ٢. *[مجازی]* کەرەستەیەکی خڕی هەڵۆڵ کە هێندێک تۆپی ژمارەداری تێدایە (زۆرتر دە تۆپ، لە سیفرەوە تا نۆ) بۆ بەخت‌ئەزموونی، هەڵیدەسووڕێنن و هەر جارە تۆپێکی لێ‌دادەکەوێ ٣. قەفەسەی تەگەرەداری جێبەجێ‌کردنی کتێب لە ناو کتێبخانەدا.

▣ **از گردونه خارج شدن:** لە دەور/ گەردوونە دەرچوون ‹آزاد هم زن گرفت و از گردونه خارج شد: ئازادیش ژنی هێنا و لە دەور دەرچوو›. هەروەها: **از گردونه خارج کردن**

**گرده** / garde ، ـها/: *اسم. [گیاه‌شناسی]* گەرک؛ گەردە؛ هەلاڵە؛ گانەی نێری گیای تۆمدار کە دەنکێکی وردیلەی توێکڵدارە کە بە دەم باوە دەچێ یان بە جانەوەرەوە دەنووسێ.

**گرده** / gerde/: *اسم.* ١. ـها/ کولێرە؛ کوللێرە؛ کولۆر؛ کولۆرە؛ ستورک؛ ئەستورک؛ ئەستورکە؛ گرک؛ پاتۆ؛ پاتۆلە؛ گیتێ؛ خەرسەک؛ خەپک؛ خەپلە؛ سەوک؛ جۆرێ نانی خڕ و ئەستوورە ٢. گردە؛ برینجەگردە؛ جۆرێک برینجی خڕتی ورد بۆ ناو ئاش، شیربرنج و شلە.

▣ **گردەی خون:** گردیلەی خوێن؛ ترومبوسیت؛ پلاکیت؛ گەردەی وردی پووڵەکەیی ناو خوێن بۆ گرساندنەوەی خوێن.

**گرده** / gorde/: *اسم.* ١. کۆڵ؛ گوردی؛ شان؛ سەرشان ٢. گورچیلە؛ گووچیلە؛ گورچەویلە؛ گورچیکە؛ گووچیلک؛ گورچوو؛ گورچک؛ گرچک؛ ولک؛ گوردالە؛ کشتە.

▣ **از گردەی کسی کار کشیدن:** *[کنایی]* کۆڵ بە کەسێ کێشان؛ بەرد بە کەسێ کێشان؛ کوچک پێ‌کێشان؛ بە کۆڵی کەسێک بار کێشان؛ کاری زۆر و دژوار لە کەسێ کێشانەوە ‹از گردەی همەمان کار کشید: کۆڵی بە هەموومان کێشا›.

**بە گردەی کسی سوار شدن:** *[کنایی]* سوار مل/ کۆڵی کەسێ بوون؛ دوولنگە بە مل کەسێکدا شۆڕ کردنەوە ‹اگر رو بدهی دو روز دیگر بە گردەات سوار می شود: ئەگەر بدەیتە دەمیەوە دوو ڕۆژی‌تر سواری ملت ئەبێ›.

**گردەافشانی** / garde'afšānî ، ـها/: *اسم.* گەردەپژێنی؛ بڵاوەی گەردە، لە ئەندامی زاوزووی نێرەوە بۆ ئەندامی زاوزێ مێ، بە

شێوەی ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ (بە هۆی با، ئاو و مێروو).

**گردهمائی** / gerdehamā'î/ ☜ **گردهمایی**

**گردەماهی**[1] / gordemāhî ، ـها/: اسم. کۆمی؛ کۆماوی؛ کۆماوەیی؛ کووڕی؛ قۆزی؛ هەڵهاتوویی بە باری درێژیدا.

**گردەماهی**[2]: صفت. کۆم؛ کۆماوە؛ کۆماو؛ کووڕ؛ قۆز؛ گورگەپشت؛ بە باری درێژییدا هەڵهاتوو.

**گردهمایی** / gerdehamāyî ، ـها/: اسم. کۆبوونەوە؛ کۆڕ؛ کۆ؛ گور؛ گردی؛ جڤات؛ جوات؛ لژنە؛ چەپەربەندان؛ کۆمەڵێ مرۆ کە بۆ ڕاوێژ لێک کۆ بوونەتەوە ‹گردهمایی استادان دانشگاه: کوبوونەوەی مامۆستایانی زانستگا›: **گردهمائی**

**گردی** / gardî/: صفت. ١. خۆڵاوی؛ خۆڵین؛ تۆزاوی؛ ڕتامی؛ بە خاک و خۆڵەوە تلاو ٢. ـها/ [گفتاری] گەردی؛ گەرتی؛ توشیاری هیرۆیین.

**گردی** / gerdî/: اسم. خڕی؛ گردی؛ خرتی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی خڕ بوون ‹گردی و درازیش مهم نیست: خڕی و درێژیەکەی گرینگ نیە› ٢. بەشی جەغز ئاسای شتێک ‹تنها گردی صورتش پیدا بود: تەنیا خڕی دەم و چاوی دیار بوو›.

**گردی** / gordî/: اسم. [ادبی] دلێری؛ پاڵەوانی؛ گوردی.

**گردیدن** / gardîdan/: مصدر. لازم. // **گردیدی**: گەڕای؛ **می گردی**: دەگەڕی؛ **بگرد**: بگەڕە// گەڕان؛ گەریان؛ سووڕ خواردن؛ گێڵەی؛ گێلای: ١. سووڕان؛ خول خواردن؛ چەرخان؛ بەرەو پێش چوون ‹کار می‌گردد: کار دەسووڕێ› ٢. سەفەرکردن؛ سەیران‌کردن؛ گەشت و گێڵ‌کردن ٣. ئاڵ‌وگۆڕ بوون/ کران؛ ئەم دەست و ئەودەست بوون ‹این ماشین تا حالا چند دست گردیده: ئەم ماشینە هەتا ئێستا چەند دەست گەڕاوە› ٤. [مجازی] گۆڕان؛ گۆڕیان؛ وارپەی؛ وارپای ٥. دانە پەی؛ جست‌وجۆ کردن؛ پشکنین ٦. [قدیمی] هەڵگەڕانەوە؛ هۆروێڵەی. هەروەها: **گردیدنی**

■ صفت فاعلی: **گردنده**: (ـ)/ صفت مفعولی: **گردیده**: (گەڕاو)/ مصدر منفی: **نگردیدن**: (نەگەڕان)

**گرز** / gorz ، ـها/: اسم. [قدیمی] هوویزی؛ زۆپە؛ گوورز؛ گوویرز؛ گورز؛ گۆڕ؛ گۆپاڵ؛ کۆپاڵ؛ کۆپار؛ گالوک؛ ئامرازێکی سەر ئەستووری دەسکدارە بۆ شەڕ.

▣ **گرز دیو** ☜ دودکش جن، **دودکش**

**گرزەپایی** / gorzepāyî/ ☜ **پاچنبری**

**گرسنگی** / gorosnegî ، ـها/: اسم. برسیەتی؛ برسێتی؛ برسیایەتی؛ برسیاتی؛ بەرچیتی؛ بەرچێتی؛ بەرچینی؛ ئاورایی؛ نێزی؛ نێزاتی؛ هەورایی؛ ئاورەی؛ ئاورای؛ وڕە؛ بار و دۆخی ورگ بەتاڵ بوون ‹از گرسنگی داشتم می‌مردم: لە برسیەتیدا خەریک بوو بمرم›.

▣ **گرسنگی دادن**: برسی هێشتنەوە؛ ئاورای ئاستەیوە؛ نان پێنەدان ‹نامادری به آنها گرسنگی می‌داد: باوەژنەکەیان برسی دەیانیهێشتەوە›.

**گرسنگی کشیدن**: برسیەتی‌کێشان؛ ئاورەی کێشتەی ‹بچەها به گرسنگی کشیدن عادت کرده بودند: منداڵەکان بە برسیەتی کێشان ڕاهاتبوون›.

**گرسنە** / gorosne ، ـها؛ ـگان/: صفت. برسی: ١. برچی؛ نێز؛ هەورا؛ ئاورا؛ ئۆرا؛ وسنە؛ وسێ؛ ورسنی؛ ورسگ؛ گێست ‹نصف شب خیلی گرسنه‌ام شد: نیوە شەو زۆر برسیم بوو› ٢. [کنایی] زۆر ئاتاج و داماو. هەروەها: **گرسنە بودن؛ گرسنە شدن**

**گرسنەچشم** / gorosnečešm ، ـان/: صفت. [مجازی، ادبی] چاوبرسی؛ بەرچاوبرسی؛ چاوبرچی؛ چاوچنۆک؛ چاونەزێر؛ چەڵماس؛ لێشتۆک؛ تەماکار. هەروەها: **گرسنەچشمی**

**گرفت** / gereft ، ـها/: اسم. ڕەوتی گیران؛ کەوتنی تەنێکی ئاسمانی وەبەر سێبەری تەنێکی‌تر ‹گرفت ماه: مانگ گیران›.

▣ **گرفت خورشید**: ڕۆژ گیرسە؛ هەتاوگیران؛ خۆرگیران؛ ڕۆژگیران؛ ڕۆجیارگیریەی؛ ڕۆژ

خەیرین.

**گرفت ماه:** ماگیرسە؛ ماگرتە؛ مانگ گیران؛ گیرانی مانگ؛ هەیڤ خەیرین.

**گرفتار** / gereftār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* تووش؛ تووشیار؛ گیرۆدە؛ گراو: ۱. یەخسیر؛ ئەسیر؛ دیل؛ پێوەبوو ‹چند نفرمان گرفتار شدند بقیه فرار کردیم: چەند کەسمان یەخسیر بوون باقی هەلاتین› ۲. دوچار؛ گرفتار؛ پابەند؛ پابەن؛ ئەوگار؛ گیر ‹چند سال است گرفتار بیماری و خانەبەدوشی است: چەن سالێکە تووشی نەخۆشی و لانەوازیە› ۳. *[کنایی]* ئەویندار.

⊡ **گرفتار بودن:** گرفتار بوون؛ گیرۆدە بوون؛ تووش بوون؛ حەوق بوون؛ حاوقان؛ گیرخواردن؛ گیرواردەی. هەروەها: **گرفتار شدن؛ گرفتار کردن**

**گرفتاری** / gereftārî ، ـها/: *اسم.* گیرۆدەیی؛ گراوی؛ مەرە: ۱. گیر و گرفت؛ گێرەوکێشە؛ بەدبەختی؛ ئەوەی دەبێتە هۆی ئازار و پەژارە (وەک نەخۆشی، هەژاری و...) ‹خودش کلّی گرفتاری دارد: بۆ خۆی زۆرێک گیر و گرفتی هەیە› ۲. تەنگانە؛ گیرۆیی؛ داف؛ دۆخی گران و ئازاردەر ‹در گرفتاری به دادم رسید: لە تەنگانەدا گەیشتە فریام› ۳. یەخسیری؛ ئەسیری؛ دۆخی گیران؛ لە دەستدانی ئازادی و سوکنایی پێشوو ‹فعالیت‌های گذشته موجب گرفتاری او شد: چالاکی رابردووی بوو بە هۆی گیرانی›.

**گرفتگی**[1] / gereftegî ، ـها/: *اسم.* ۱. گیراوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەستراو بوون و گیران ‹گرفتگی لوله: گیرانی لوولە› ۲. *[مجازی]* داگیراوی؛ پەشێوی؛ ماتی؛ خەمباری؛ خەمگینی؛ کزی ‹از گرفتگی قیافه‌اش معلوم بود مشکلی دارد: بە داگیراوی سەر و چاویدا دیار بوو گرفتێکی هەیە›.

**ـــ گرفتگی**[2]: *پیواژه.* ۱. داگیراوی؛ ژانەسەر، سەرگێژە و دڵ پێکداهاتن بە هۆی لە شوێنێکدا بوون (وەک ماشین، کەشتی، قەتار، فڕۆکە و ...) ۲. ـەنگازی؛ ـ نگازی؛ ئازاری لەش بە هۆی کار تێکردنی شتێک ‹گازگرفتگی: گازەنگازی›.

**گرفتن** / gereftan/: *مصدر. متعدی. لازم.* //**گرفتی:** گرتت؛ **می گیری:** دەگری؛ **بگیر:** بگرە// گرتن؛ گردن؛ هلانین؛ گرتەی؛ گێرتەی: ☐*متعدی.* ۱. ئەستاندن؛ ستاندن؛ لێ گرتن؛ لێ ساندن؛ لێ ئەستاندن؛ لێ ستاندن؛ لێ سەندن/ سەنن؛ لێ گرتن؛ وەرگرتن ‹پول گرفتن: پارە وەرگرتن› ۲. گیریای؛ گێرتەیرە؛ بە دەست یان بە شتێک ڕاگرتن ‹در آغوش گرفتن: لە باوەش گرتن› ۳. دەست خستن ‹نوبت گرفتن: نۆرە گرتن› ٤. بەکرێ گرتن ‹اتاق گرفتن: دیو گرتن› ٥. قۆلبەست کردن ‹دزد گرفتن: دز گرتن› ٦. ڕاو کردن ‹ماهی گرفتن: ماسی گرتن› ٧. گەزەنگاز بوون ‹برق گرفتن: برق گرتن› ٨. کار تێکردن ‹چیزی چشم کسی را گرفتن: شتێک بەرچاوی کەسێک گرتن› ٩. بەستن و داپۆشان ‹سوراخ گرفتن: کون گرتن› ١٠. لێ ساندن؛ لێ ئەستاندن؛ لێ ستاندن؛ پێک هێنان و دروست کردن ‹لقمه گرفتن: تیکە گرتن› ١١. هەڵسوکەوت کردن ‹سخت گرفتن: سەخت گرتن› ١٢. پێوەندی دامەزراندن/ کران ‹تلویزیون گرفتن؛ شماره‌تلفن گرفتن: تلویزیون گرتن؛ ژمارەتەلەفون گرتن› ١٣. تێگەیین؛ وەرگرتن؛ ‹حرف کسی را گرفتن: لە قسەی کەسێک تێگەیین› ١٤. هەستاندن؛ بێبەش کردن؛ سەندن؛ سەنن؛ سانای؛ لێ سەندن/ سەنن؛ لێ ساندن؛ لێ ئەستاندن؛ لێ ستاندن ‹دار و ندار کسی را گرفتن: دار و نەداری کەسێ گرتن› ١٥. خستنە نێو چوارچێو و پۆشەنەوە ‹قاب گرفتن؛ دست شکسته را گچ گرفتن: لە قاپ گرتن؛ دەستی شکاو لە گەچ گرتن› ١٦. درێژە دان؛ گرتنە بەر ‹دنباله‌ی حرف را گرفتن: شوێنی قسە گرتن› ١٧. لە پێناوی کەسێکدا کارێ کردن ‹طرف کسی را گرفتن: لایەنی کەسێ گرتن› ١٨. لە کێبەرکێ یان ڕەدووکەوتندا

پێگەیشتن؛ گێرتەیوە؛ گرتنەوە ‹اسب‌سوار ماشین را گرفت: سوارەکە ماشینەکەی گرت› ۱۹. سڕین؛ لێ‌کردنەوە ‹لکه گرفتن؛ گرد گرفتن: لەک گرتن؛ تۆز سڕین› ۲۰. لێ‌گرتن؛ گرتنەوە؛ دەسنیشان‌کردن ‹عیب گرفتن؛ غلط گرفتن: عەیب لێ‌گرتن؛ هەڵە گرتنەوە› ۲۱. داگیرکردن ‹جا گرفتن: جێ‌گرتن› ۲۲. هەڵبژاردن؛ تەلبژێن‌کردن ‹دوست گرفتن: دۆست هەلبژاردن› ۲۳. *[مجازی، گفتاری]* کڕین؛ سەندن/ سەنن؛ گرەوتش ‹از بازار چیزی گرفتن: لە بازاڕ شتێک سەندن› ۲٤. دامەزراندن یان بۆ کارێ گرتن ‹به خدمت گرفتن؛ کارگر گرفتن: وە خزمەت گرتن؛ کرێکار گرتن› ۲۵. وەرگیران؛ ڕاگرتن بەبێ جووڵە ‹در را برایش گرفتم که رد بشود: درگاکەم بۆ گرت بڕوا› ۲٦. دەرهێنانی ئاوی شتێک ‹روغن گرفتن؛ آب هندوانه گرفتن: ڕۆن گرتن؛ ئاوی شووتی گرتن› ۲۷. لێ کردنەوە و فڕێ‌دان ‹ناخن گرفتن: نینۆک گرتن› ۲۸. بەرگرتن؛ بەرگری‌کردن ‹جلو رفت‌وآمد را گرفتن: بەر بە هاتوچۆ گرتن› ۲۹. دانان؛ زانین؛ واگرتن ‹دست‌کم گرفتن: بە کەم دانان› ۳۰. ڕێوڕەسمێک بەڕێوە بردن ‹روزه گرفتن: ڕۆژوو گرتن› ۳۱. *[گفتاری]* گاڵتە پێ کردن ‹تو هم مرا گرفته‌ای: ئەتۆش گاڵتەم پێ دەکەی› ۳۲. تێ‌گرتن؛ دانەبەر؛ ئەنەگێرتەی ‹به سنگ گرفتن: بەرد تێ‌گرتن› □ *لازم.* ۳۳. دێران؛ دارەی؛ جێ بوونەوە ‹این قوری چهار استکان می‌گیرد: ئەم قۆریە چوار پیالە دەگری› ۳٤. دادان؛ دەس پێکردن؛ گێرتەینە ‹باران گرفتن: باران دەس پێکردن› ۳۵. بە بار و دۆخێکدا کەوتن؛ دڕۆسەی ‹آرام گرفتن: ئارام گرتن› ۳٦. تووشی نەخۆشی بوون ‹آبله گرفتن: ئاولە گرتن› ۳۷. ڕیشەدان و گەشەکردن؛ بوون ‹درختی که قلمه زده بودی، گرفت: ئەو دارەی قەڵەمەت کردبوو، گرتی› ۳۸. گیران؛ بەسران؛ گیریەی ‹گرفتن لوله: بەسرانی لوولە› ۳۹. گیران؛ گیریەی (بۆ خۆر و مانگ) ‹خورشید گرفتن: خۆر گیران› ٤۰. گیران؛ گیریەی؛ کاری ئاسایی خۆ لە دەست دان ‹گرفتن صدا: دەنگ گیران› ٤۱. گیران؛ داگیران؛ ئەرەگیریەی؛ خەمبار و ناڕەحەت بوون ‹دل کسی گرفتن: دڵی کەسێک گیران› ٤۲. گیران؛ داتەمان؛ هەورکردن ‹گرفتن هوا: هەوا گیران› ٤۳. هاتن؛ داگرتن ‹بازی کردنش گرفت: کایەی هات› ٤٤. سەرکەوتن؛ بۆ گرتن ‹کارش گرفت: کارەکەی گرتی› ٤۵. کرداری هاوکرد: *الف:* (بۆ جەخت) ‹بگیر بخواب!: زووکە بنوو!› *ب:* (بۆ پێوان) ‹اندازه گرفتن: ئەندازە گرتن›.

هەروەها: **گرفتنی**

■ **صفت فاعلی: گیرنده** (ـ)/ **صفت مفعولی: گرفته** (گیراو)/ **مصدر منفی: نگرفتن** (نەگرتن)

**گرفت و گیر** / gereft-o-gîr ، ـها/:*اسم.* ۱. بگر- بگر؛ بگرە- بگرە؛ بگرە و بەردە؛ کار یان ڕەوتی گیران یان بەندکردنی کۆمەڵێک ‹بعد از کودتا گرفت و گیر شروع شد: دوای کوودەتا بگر ـ بگر دەستی پێکرد› ۲. *[کنایی]* گیر و گرفت؛ بار و دۆخێکی گران و پڕمەترسی ‹در این گرفت و گیر نباید کاری بکنی: لەم گیر و گرفتەدا نابێ کارێ بکەی›.

**گرفته** / gerefte/: *صفت.* داگیراو: ۱. خەمبار؛ خەمین؛ ئەرەگیریا ‹قیافەی گرفته: ڕواڵەتی داگیراو› ۲. *[هواشناسی]* هەوری؛ هەور و هەڵا؛ نەساو؛ تەمبار؛ تەم‌گرتوو ‹هوای گرفته: هەوای هەوری›.

**گرگ** / gorg/:*اسم.* گورگ؛ گور: ۱. *[نجوم]* وێنەیەکی ئاسمانی لە لەتەگۆی باکووردا: سَبُع ۲. /ـها؛ ـان/ گوری؛ وەرگ؛ ڤەرک؛ ڤەرق شینۆ؛ گیانەوەری گوانداری سەگ‌ئاسا بە گوێی چکۆلە و کلکی درێژ و دەست و پێی بەرز و شاویلکەی زۆر بە قەوەتەوە کە دڕندەیە و گۆشت دەخوا، ڕەنگی سپی، خۆڵەمێشی، خورمایی و ڕەشی هەیە ۳. *[مجازی]* گول؛ کەسێ کە لە برێ کایەی منداڵاندا دەبێ بگەڕێ باقی بدۆزێتەوە و

بیانگرێ.

▣ گرگ باران‌دیده: گورگی ڕاو دیده؛ سارد و گەرمی ڕۆژگار چێشتوو ‹او طوری نمی‌شود گرگ باران‌دیده است: هیچی پێ نایێ گورگی ڕاو دیدەیە›. تێبینی: لەم دەستە واژەدا «گرگ بالان‌دیده» دروستە، «بالان» بە مانای تەڵە، داو، فاق. یانی گورگێک کە ئەزموونی بە تەڵەوە بوونی هەبووبێ و خەلەستبێ، دەنا هەموو گورگێک بەفر و باران هەر دەبینێ!

گرگ پیر: *[کنایی]* کۆنە گورگ؛ کۆنە سەگ؛ پیرەمێردی وریا و فێڵباز.

گرگ تیرخورده: *[کنایی]* ماری زامدار؛ بەرازی غەزریو؛ هەشێ پێکەی؛ کەسی بە ئاکام نەگەیشتووی تووڕە ‹حالا او مثل گرگ تیرخورده خطرناک است: ئێستە وەک ماری زامدار بڤەیە›.

گرگ دهن آلوده و یوسف ندریده: *[کنایی]* چێشتی نەخوارو و دەمی سووتاو؛ ماچی نەکریا و زەنگی زڕیا؛ تاوانبارکراوی بە ناحەق.

**گرگرفتگی** / gorgereftegî ، ـها/: [از کردی/ فارسی]/*اسم.* داگیرساوی؛ گڕگرتوویی؛ داگرسیاگی؛ هەست بە گەرمایەکی زۆر لە لەشدا کە کوتوپڕ دێ و دەڕوا.

**گرگ‌سگ** / gorgsag ، ـان/: *اسم.* *[قدیمی]* گورگەمێش؛ سەگی بە ڕەگەز گورگ یان وەکوو گورگ.

**گرگم‌به‌هوا** / gorgambehavā/: [فارسی/ عربی] *اسم.* گوری ـ گوری؛ حەمەگورگێ؛ گەمەیەکی منداڵانەیە، یەکێ دەبێتە گورگ ئەوانی‌تر بگرێ، هەر کەس گیرا ئەو دەبێ بە گورگ.

**گرگم‌و‌گله‌می‌برم** / gorgamogallemîbaram/: *اسم.* گورگ و شوان؛ گەمەیەکی منداڵانە کە دوو کەسی گەورەتر یان یەکێ دەبێتە گورگ و یەکێ‌تر دەبێتە شوان و ئەوانی‌تر (منداڵان) دەبنە ڕان، گورگ پەلاماری ڕان دەدا و شوان بەری پێدەگرێ و ناهێڵێ بیبا.

**گرگ‌و‌میش** / gorg-o-mîš/ ☜ هوای گرگ و میش، **هوا**

**گرگی** / gorgî/: *صفت.* گورگی؛ وەکوو گورگ ‹سگ گرگی: سەگی گورگی›.

**گرل‌فرند** / gerlf(e)rend ، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* قل؛ دۆس؛ کچەدۆس؛ دۆستی کچ (بۆ کوڕ).

**گرم** / garm/: *صفت.* گەرم: ۱. بەتین؛ بە هۆی خۆر، ئاور یان کارەباوە تین گرتوو ‹اتاق گرم: دیوی گەرم› ۲. گەرمکەرەوە ‹لباس گرم: جلی گەرم› ۳. *[مجازی]* بەتین؛ گەرم و گوڕ؛ زۆر گەرم و نزیک ‹رابطەی گرم: پێوەندی گەرم و گوڕ› ٤. *[مجازی]* بەتین؛ دلگر؛ نەرم؛ دڵنشین ‹صدای گرم: دەنگی گەرم› ٥. *[مجازی]* بەتین و تاو ‹بازار گرم: بازاڕی گەرم› ٦. بە تینێکی زیاتر لە ڕادەی ئاسایی ‹هوای گرم: هەوای گەرم›.

▣ گرم بودن: *[گفتاری]* گەرما بوون؛ گەرم بوون/ بیەی ‹گرمم بود لباسم را درآوردم: گەرمم بوو جلەکانم دەرهێنا›.

گرم شدن: ۱. گەرم بوون؛ گەرمەو بوون؛ گەرمەوە بیەی ‹اتاق گرم شد: هۆدەکە گەرم بوو› ۲. *[کنایی]* گەرم داهاتن؛ تین تێگەڕان؛ گەرم بیەی؛ گەرم ڕاهاتن ‹بعد از یک ساعت وراجی تازه گرم شده: دوای ساعەتێک چەنە دان تازە گەرم داهاتووە› ۳. گەرما بوون؛ گەرم بیەیوە؛ هەست بە گەرما کردن ‹گرمش شد: گەرمی بوو›.

گرم کاری بودن: خەریک کارێک بوون؛ سەرقاڵی کارێ بوون؛ سەرگەرمی کارێک بوون ‹گرم تماشای تلویزیون بودیم: خەریک تەماشای تەلەڤزیون بووین›.

گرم کردن: گەرم‌کردن/ کردنەوە؛ گەرماندن؛ گەرمەوەکەردەی ‹اتاق را گرم کرد: هۆدەکەی گەرم کرد›.

گرم گرفتن: *[مجازی]* گەرم‌گرتن/ کردن؛ تێکەڵ بوون ‹با من خیلی گرم گرفت: لەگەڵمدا

زۆر گەرمی گرت›.

**گــرم** / g(e)ram ، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. گـرەم: ۱. یەکـــەی کـــێش بەرامبـــەر بـــە ۰٫۰۰۱ی کیلـۆگرەم ۲. /فیزیـک/ یەکـــەی جـرم (مـــاکی پێکهێنەری هەر شتێک).

**گرم** / gorm/:اسم. /گفتاری/ گرە؛ گرێ؛ گروزین؛ لکە؛ فکلە؛ گومتیل؛ هەڵتۆقاوی ماسوولکە ‹گرم بازو: گرەی باسک›.

**گرما** / garmā/:اسم. گەرما؛ گێرما؛ وەشت؛ تین؛ تـینی؛ تـاو: ۱. گـەرمن؛ گێـر؛ گـڕە؛ تـینی زۆر ۲. گەرما و تینی زۆرتر لـە ڕادەی ئاسـایی یـان دڵخواز ۳. گەرمەوزە؛ گەرمەوەزە؛ تینێکی زێـدە کە دەبێتە هۆی گەرم بوون، توانەوە، هەڵم کردن یان کێش هاتنی شتومەک ٤. /شیمی ــ فیزیـک/ تین و تا؛ جۆرێ وزەی پرشنگی.

▣ **گرمای اتمی**: /شیمی ـ فیزیک/ تـینی ئـەتومی؛ گەرمی ئـەتومی؛ ئـەنجامی لێکـدانی کێشـی ئەتومی توخمێک لە گەرمی تایبەتی خۆیـدا: **حرارت اتمی**

**گرمای احتراق** ☜ **گرمای سوخت**

**گرمای انحلال**: تینی توانـەوە؛ ڕادەی تینێـک کـە یـەک مولکـوول گرەمـی ماکێـک کـاتی توانەوە لە ئاودا دەیگرێ یـان دەیداتـە دواوە: **حرارت انحلال**

**گرمـای تابشـی**: تـینی تابشـت؛ تینێـک کـە شەبەنگی نادیاری خواری سوور بەدی دێنـێ: **حرارت تابشی**

**گرمای تشکیل**: تینی بەرهەمهاتن؛ گەرمایێک کە کاتی بەرهەم هاتنی ماکێک لە تێکئاڵانی توخمە سەرەتاییەکانیدا بەدی دێ یان دەکار دەچێ: **حرارت تشکیل**

**گرمای تموز**: قرچەی هاوین؛ چلەی تاوسـان؛ گەرمــەوەزە؛ گەرمــەوزە؛ جەنگـەی گـەرمای هاوین.

**گرمای ذوب**: تینی توانەوە؛ هەنـدی گـەرمای پێویست بۆ توانەوەی تەنێک: **حرارت ذوب**

**گرمــای ســوخت**: تــینی ســووتان؛ ڕادەی گـەرمای بـەدیهاتوو لـە سـووتانی یـەکجاری یەک مولکوول گرەمی ماکێک: **گرمای احتراق؛ حرارت احتراق؛ حرارت سوخت**

**گرمای مخصوص** ☜ **گرمای ویژە**

**گرمـای ملکـولی**: /شـیمی ــ فیزیـک/ گـەرمی مولکـــوولی؛ ئـــەنجامی لێکـــدانی کێشـــی مولکوولی تەنێ لێکدراو لە گـەرمای تایبـەتی خۆیدا: **حرارت ملکولی**

**گرمای ویژە**: /شیمی ـ فیزیک/ تـینی تایبـەت؛ ئەو ڕادە لە تین و تا کە دەبـێ بگیرێتـە سـەر یــەک گرەمــی ماکێـک بـۆ ئـەوەی یـەک دەرەجەی سانتیگراد گەرمتر بێتەوە: **گرمـای مخصوص؛ حرارت مخصوص**

**گرمائی** / garmā'î/ ☜ **گرمایی**

**گرمــابر** / garmābar/: صفت. گەرمابــەر؛ بـە تایبەتمەنـدی بـردن و ڕاگـویزانی گـەرماوە. بەرانبەر: **گرمابند**

**گرمــابرق** / garmābarq/: [فارسـی/ عربـی]/اسـم. گەرمابەرق؛ کارەبای بەدیهاتوو لە تین و تا.

**گرمــابری** / garmābarî/:اسـم. گەرمابـــەری؛ چۆنیـــەتی گۆزانـــەوەی گـــەرما، خازمـــا تایبەتمەندییێک کە لە بڕێ تەندا هەیە. بەرانبەر: **گرمابندی**

**گرمابنـد** / garmāband/: صفت. گـەرماگر؛ بـە تایبەتمەنـدی یـان توانسـتی بـەرگری لـە دزە کردنی گەرما. بەرانبەر: **گرمابر**

**گرمابندی** / garmābandî/:اسم. گەرماگری؛ کار یان ڕەوتی بەرگریکردن لە دزە کـردنی گـەرما لە تەنێکەوە بۆ تەنێکیتر. بەرانبەر: **گرمابری**

**گرمابـه** / garmābe ، ـهـا/:اسم. /ادبی/ گـەرماو؛ گەرماوە؛ گەرماگە؛ گەرماڤ؛ سەرشۆک؛ حەمام؛ شوێنی خۆ شۆردن، بەتایبەت حەمامی گشتی.

▣ **گرمابــەی طبیعــی**: گەرمکـــە؛ گـــەرماوی

سروشتی؛ شوێنی کە ئاوەکەی بە شێوەی سروشتی گەرمە.

**گرمابه‌دار** / garmābedār ، ـها؛ ـان/:اسم. گەرماوەڤان؛ حەمامچی؛ خاوەن حەمام. هەروەها: **گرمابه‌داری**

**گرمادرمانی** / garmādarmānî/:اسم. [پزشکی] گەرمادەرمانی؛ کار و ڕەوتی کەڵک وەرگرتن لە گەرما بۆ دەرمان.

**گرمادوست** / garmādûst/: صفت. [زیست‌شناسی] گەرماواز؛ بە تایبەتمەندی ڕوان و گەشەکردن لە ئاقاری گەرمدا.

**گرمازا** / garmāzā/: صفت. گەرمادەر؛ بە توانایی بەدیهێنانی گەرما.

**گرمازایی** / garmāzāyî/:اسم. گەرمادەری؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی بەدیهێنانی گەرما.

**گرمازدگی** / garmāzadegî ، ـها/:اسم. گەرمازۆیی؛ گەرماگەزی؛ گەرمابردوویی؛ گەمابردەیی؛ بار و دۆخی بوورانەوە، ڕشانەوە، بێحاڵی و ئارەق دەردانی لەڕادەبەدەر بە هۆی مانەوە لە شوێنی گەرمدا ‹در خانقین چندین نفر دچار گرمازدگی شدند: لە خانەقیندا چەن‌کەس تووشی گەرمازویی بوون›.

**گرمازده** / garmāzade ، ـها؛ ـگان/: صفت. گەرمازۆ؛ گەرماگەز؛ گەرمابردە؛ شەرابردە؛ شەرابردوو ‹گرمازده شده بودم، حالم خیلی بد بود: گەرمازۆ ببووم حاڵم شڕ بوو›.

▣ گرمازده شدن: گەرمخان؛ داهێزان؛ گەرمخین؛ گەرما بردن؛ گەرمازۆ بوون؛ نەخۆش کەوتن لە بەر گەرمان.

**گرماسخت** / garmāsaxt/: صفت. گەرماسەخت؛ نەگۆڕ لە بەر گەرما. بەرانبەر: **گرمانرم**

**گرماسنج** / garmāsanc ، ـها/:اسم. گەرماپێو؛ گەرماژمێر؛ کەرەستەی ئەندازەگرتنی گەرما.

**گرماشیمی** / garmāšîmî/: [فارسی/ فرانسوی]/اسم. لقێک لە زانستی کیمیا کە لە سەر پێوەندی نێوان گەرما و کاردانەوەگەلی کیمیایی دەکۆڵێتەوە.

**گرماگرم** / garmāgarm/:اسم. گەرماوگەرم؛ گەرمای گەرم؛ گەرمەگەرم؛ کەلاکەل؛ کەلدایا؛ کولەکول؛ قرچە؛ گەرمە؛ جەنگە ‹در گرماگرم کار: لە گەرماوگەرمی کاردا›.

**گرماگیر** / garmāgîr/: صفت. گەرماگر: ۱. بە تایبەتمەندی ساردکردنەوەی شوێنێک بە هۆی گرتنی تینی ئەو شوێنە ۲. خاوەن تایبەتمەندی گەرم بوونەوە بە گرتنی تین لە دەور و بەری خۆی. هەروەها: **گرماگیری**

**گرمانرم** / garmānarm/: صفت. گەرمانەرم؛ نەرم و فل لە بەر گەرما. بەرانبەر: **گرماسخت**

**گرمایش** / garmāyeš/:اسم. گەرماسازی؛ کار و ڕەوتی بەدیهێنانی گەرما.

**گرمایشی** / garmāyešî/: صفت. پێوەندیدار بە گەرماسازیەوە.

**گرمایی** / garmāyî ، ـها/: صفت. [گفتاری] گەرمایی؛ گەرمن؛ لاواز و بەرگەنەگر لە بەر گەرما: **گرمائی**

**گرمب** / goromb/: صوت. گرمب؛ گرم؛ زرم؛ زرمە؛ گرمە؛ دەنگی کەوتنی شتی زل و نەرم.

**گرمبیدن** / gorombîdan/ ☜ **گرنبیدن**

**گرمخانه** / garmxāne ، ـها/:اسم. گەرمخانە؛ ماڵی لە شووشە کە گەرما و شێ و هەوای لە ڕادەی پێویستی تێدا ڕاگیراوە بۆ بەخێوکردنی گوڵ و گیا.

**گرمرو** / garmrû ، ـیان/: صفت. [مجازی، ادبی] ڕووگەش؛ خۆشڕوو؛ ڕووخۆش؛ ڕووخوەش؛ ناوچاوڕۆشن؛ خاوەن خۆ و ئاکاری دۆستانە.

**گرمرویی** / garmrûyî ، ـها/:اسم. [مجازی، ادبی] خۆشڕوویی؛ ڕووگەشی؛ ڕووخۆشی؛ ڕووخوەشی؛ ناوچاوڕۆشنی؛ هەڵس‌وکەوتی جوان و ڕێزگرانە لەگەڵ خەڵکدا.

**گرمسیر** / garmsîr/:اسم. گەرمیان؛ گەرمێن؛

گەرمسێر؛ گەرمەسێر؛ گەرمانی؛ گەرمۆک؛ وڵاتێ کە تینی ڕۆژی زۆورتر لە °٤٠ دەڕوا ‹پرندگان به گرمسیر کوچ کردند: پەلەوەرەکان بەرەو گەرمیان بوونەوە›.

**گرمسیری** / garmsîrî/: *صفت.* گەرمەسێری؛ گەرمیانی؛ گەرمێنی؛ سەربە گەرمانی ‹هوای گرمسیری: هەوای گەرمەسێری›.

**گرمك** / garmak ، ـها/: *اسم.* گرکە؛ گرکەگ؛ گەرمک؛ حەنجۆر؛ خرچەی خڕی لاقووپاو کە گۆشتەکەی ئاودار و هێندێک شیرینە.

**گرمکره** / garmkore/: [فارسی/ عربی] *اسم.* بەشێک لە کەشی زەوی لە ٨٠ کیلۆمیتر بەرەوبان، کە هەر چی بڕوا گەرمتر دەبێ: **دماسپهر؛ دماکره**

**گرمکن** / garmkon ، ـها/: *اسم.* ١. گەرمکەرەوە؛ تینبەخش ٢. جلی کێشبافی گەرم کە بۆ وەرزش یان لە سەرمادا، لە ژێر جلیترەوە دەبەری دەکەن.

**گرم و سرد** / garm-o-sard/ ☜ **سرد و گرم**

**گرم و نرم** / garm-o-narm/: *صفت. [گفتاری]* گەرم و نەرم؛ دڵبزوێن؛ لەبار و خۆش بۆ لەش ‹جای گرم و نرم: جێگەی گەرم و نەرم›.

**گرمی** / garmî/: *اسم.* گەرمی: ١. گەرما؛ گەرمایی؛ گەرمێتی؛ گەرماهی؛ گڕ؛ دۆخ یان چۆنیەتی گەرم بوون ‹گرمی هوا: گەرمای هەوا› ٢. *[مجازی]* دۆستی و مێر و چێری ‹مرا با گرمی پذیرفت: به گەرمی گلمیداوە› ٣. *[مجازی]* بڕەو؛ ڕەونەق ‹گرمی بازار: گەرمی بازاڕ› ٤. بیر و بۆچوونی کۆن سەبارەت بە تایبەتمەندی بڕێ لە خواردەمەنی و خواردنەوە کە دەبێتە هۆی زۆر بوونەوەی گەرمی لەش، دەرهاتنی جۆش و کوان و بڕێک نەخۆشیتر ‹گفتم اینقدر گرمی نخور!: گوتم هێندە گەرمی مەخۆ!›. هەروەها: **گرمی شدن؛ گرمی کردن**

▣ **گرمی بازار:** *[مجازی]* گەرمی بازاڕ؛ بڕەوی بازاڕ؛ ڕەونەقی بازاڕ ‹سرما باعث گرمی بازار بخاریفروش‌ها شده است: سەرما بووەتە هۆی گەرمی بازاری کوورەفرۆشان›.

▣ **گرمی بخشیدن:** *[مجازی]* گەرمکردن؛ گەرمی پێدان؛ گەرمی دان ‹آمدن شما به مجلس ما گرمی بخشید: هاتنتان کۆڕەکەمانی گەرم کرد›.

**گُرنبیدن** / gorombîdan, goronbîdan/ ☜ **غُرُمبیدَن: گرمبیدن**

**گرو** / gerow, gero:/: *اسم.* گرێو؛ گرەو؛ گرەوی؛ گراف: ١. شتێکی بەنرخ کە بۆ دەستەبەری دانەوەی وام، بە لای وامدەرەوە دەمێنێ ٢. بارمتە؛ ئەوی بۆ دڵنیایی لە بەڕێوە بردنی بڕیار، دادەنرێ.

▣ **گرو کشیدن** ☜ **گروکشی**

**گرو گذاشتن:** لە گرێو دانان؛ دە گرێو نان؛ نانە گرێو؛ گرەوی دانان؛ نیاینە گرەو؛ ئەنەگرەو نیەی؛ دانانی شتێک بۆ دەستەبەری دانەوەی وام یان بەڕێوە بردنی بڕیارێک ‹ساعتم را پیشش گرو گذاشتم: سەعاتەکەم لە لایەوە بەگرێو دانا›.

**گرو گرفتن:** گرتنە گرۆ؛ بارمتە گرتن؛ گرەوی سەندن ‹شناسنامه‌اش را گرو گرفتم: پێناسەکەیم گرتە گرو›.

**از گرو درآوردن:** لە بارمتە دەرهێنان؛ لە گرەو دەرهاوردن؛ لە گرەوی سەندنەوە؛ گرەوەنە ناسەی ‹پولش را دادم و ساعتم را از گرو درآوردم: پارەکەیم داوە و سەعاتەکەم لە بارمتە دەرهێنا›.

**به گرو رفتن:** چوونە گرۆ؛ بە گرۆ چوون؛ نریانە گرەو؛ دانرانە گرەوی ‹همه‌ی اثاث خانه به گرو بانک رفته بود: هەموو کەلوپەلی ناوماڵ چبووە گروی بانکەوە›.

**در گرو بودن:** لە گرۆدا بوون؛ لە بارمتەدا بوون؛ ئەنە گرەو بیەی؛ بیەی گرەوەنە: ١. بۆ دەستەبەری بەڵێنێک بە دەستی کەسێکەوە بوون ٢. پێوە بەسران؛ بەندیوار بە کار یان

ڕووداوێکی‌تر بوون ‹پایان جنگ در گرو پیروزی است: کۆتایی شەڕ لە گرەوی سەرکەوتندایە›.

**گرو کشی** / gerowkešî,gero:-/:اسم. گرۆکێشی؛ کارەڕەهاتی سەربادان لە خواستی کەسێک (وەکوو دانەوەی شتێ کە هی ئەوە یان کردنی کارێ کە داخوازیەتی) بۆ بە زۆر پێ‌کردنی کارێکی تایبەت ‹عمویت دارد گروکشی می‌کند و تا زمین را از ما نخرد راضی بە ازدواج دخترش نمی‌شود: مامت خەریکە گروکیشی دەکا و تا زەویەکەمان لێ نەکڕێ کچەکەی پێمان نادا›.

**گروگان** / gerowgān, gero:gān/:اسم. بارمتە؛ گرۆوان: ۱. *[ادبی]* گرۆ؛ گرێو؛ گرۆ؛ گرەوی؛ ئەو شتە لە گرێوی دەنێن ۲. *ـها/* گیرۆ؛ کەسێ کە بۆ بەڕێوە چوونی کارێکی تایبەت، دیل دەکرێ و بەر هەڕەشە دەکەوێ ‹سارقان، رئیس بانک را بە گروگان گرفتند: دزەکان بەرپرسی بانکیان بە بارمتە گرت› ۳. *ـها/[قدیمی]* ئەوەی بۆ دەستەبەری بەڵێنی کەس یان گرووپێک، بە لای کەس یان گرۆیەکی‌ترەوە دەمێنێتەوە.

▣ **گروگان گرفتن**: گرتنە بارمتە: ۱. کەسێک وەکوو بارمتە یەخسیرکردن ۲. شتێک بە بارمتەگرتن.

**گروگانگیری** / gerowgāngîrî, gero:gān-/، ـها/:اسم. گرۆگیری؛ بارمتەگری؛ کار و ڕەوتی بارمتەگرتن ‹هواپیماربایی و گروگانگیری از پدیده‌های زشت عصر ماست: فڕۆکەڕفێنی و بارمتەگری لە دیاردە ناشیرینەکانی سەردەمی ئێمەیە›.

**گروگذار** / gerowgozār, gero:-/، ـها؛ ـان/:اسم. گرۆدانەر؛ بارمتەدانەر؛ کەسێ کە بۆ گرتنی قەرز شتێک بە بارمتە دادەنێ.

**گروگر** / gorr-o-gor/: [از کردی] *قید. [گفتاری]* ۱. گوڕایگوڕ؛ تون‌ـ‌تون؛ بە توند و تێژی و تین‌وتا ‹گر و گر می‌سوخت: گوڕایگوڕ دەسووتا› ۲. پەساپەس؛ پەیتاپەیتا؛ هەیتاـ‌هەیتا؛ جار لە دوو جار؛ لەسەریەک ‹گروگر پول خرج می‌کرد: پەساپەس پوولی خەرج دەکرد›.

**گروگوری** / gar-o-gûrî/: *صفت. [گفتاری]* گەڕوگول؛ گەڕۆڵ؛ خاوەن ڕوخسارێکی ناشیرین و خراپ (وەکوو کەچەڵی و جێ‌زام لە دەم‌وچاو) ‹این خواستگارهای گروگوری را نفرست سراغ ما: ئەم داواکارە گەڕوگولانە مەنێرە سەرمان›.

**گروگیر** / gerowgîr, gero:-/، ـها؛ ـان/:اسم. گرەوگر؛ بارمتەگر؛ ئەوەی بۆ قەرز پێدان، شتێک بە گرێو دەستێنێ.

**گروه** / gurûh, gorûh/، ـها/:اسم. گرۆ؛ گرۆپ؛ گەل: ۱. قافلە؛ دەستە؛ کۆمەڵ؛ تیپ؛ پۆل؛ گۆل؛ چین؛ جوق؛ کەرتکە؛ جەلەب؛ قەلغە؛ ڕەڤ؛ کۆمەڵێ لە چەند شتی هاوجۆر بەتایبەت کۆمەڵێک لە چەند گیاندار ‹گروه مورچگان؛ گروه هواپیماها: گرۆی مێرووله؛ گرۆپی فڕۆکە› ۲. تاقم؛ بڕ؛ چەن کەس کە لە شوێنێکدا پێکەوەن یان پێکەوە پێوەندیەکی پتەویان هەیە ‹گروه ورزشی؛ گروه سیاسی: گرۆی وەرزشی؛ گرۆپی ڕامیاری›.

▣ **گروه آموزشی**: گرۆی فێرکاری؛ بەشێک لە زانکۆ یان خوێندنگەی بالا بۆ وتنەوەی ڕشتەیەکی تایبەت ‹گروه آموزشی دانشکده‌ی ادبیات: گرۆی فێرکاری زانکۆی وێژە و ئەدەب›.

**گروه پژوهشی**: گرۆی تۆژینەوە؛ گرۆی لێکۆڵینەوە؛ بەشی لێکۆڵینەوە؛ بەشێک لە زانکۆ یان دامەزراوەیەکی تۆژکاری بۆ لە سەر چوون و لێکۆڵینەوەی لە پەستا و ئارمانجدار.

**گروه خون**: گرۆی خوێن؛ دەستەی خوێن؛ ڕاستەی خوێن؛ جۆر و تایبەتمەندی گلوبوولەکانی خوێنی مرۆڤ و برێ ئاژەڵ کە دەکرێنە چواربەشی O,AB,B,A (یان سیفر).

**گروه فشار**: *[سیاست]* گرۆی گوشار؛ دەستەیێ کە بۆ گوشار خستنە سەر دەوڵەت یا نەیارانی سیاسی (لە ڕێی بوختان، خۆپیشاندان، هێرشی چەکدارانە و...) پێک دێت.

**گروهان** / gurûhān, gorûhān/، ـها/:اسم.

گرووهان؛ یەکەی هێزی چەکداری بریتی لە چەن دەستە، بچووکتر لە گوردان.

**گروهبان** / gurûhbān, gorûhbān ، ـها؛ ـان/: /اسم. گرووبان؛ کەسێ کە پلەی گرووبانی هەیە.

▣ **گروهبان دوم:** دوخەت؛ دوحێت؛ گرووبان دووهەم؛ کەسێ کە پلەی بانتر لە گرووبان سێهەم و خوارتر لە گرووبان یەکەمە.

**گروهبان سوم:** یەکخەت؛ یەکحێت؛ گرووبان سێهەم؛ کەسێ کە خوارترین پلەی گرووبانی هەیە.

**گروهبان یکم:** سێخەت؛ سێحێت؛ گرووبان یەکەم؛ سەرگرووبان؛ کەسێ کە بانترین پلەی گرووبانی هەیە.

**گروهبانی** / gurûhbānî, gorûhbānî/: /اسم. گرووبانی؛ هێزی چەکداری پلە خوارتر لە ئێستواری.

**گروەبندی** / gurûhbandî, gorûhbandî ، ـها/: /اسم. دەستەبەندی؛ گرۆبەندی: ۱. کار و ڕەوتی بەش بوون یان بەشکردن بە دەستە و گرۆ ۲. چۆنیەتی دابەش بوون یا دابەشکردنی دەستە و شێوازی دانانیان.

**گروەزی** / gurûhzî, gorûhzî ، ـان/: صفت. گرۆژی؛ کۆمەڵژی؛ خاوەن ژیانی دەستەیی. بەرانبەر: **تکزی** ‹جانور گروەزی: گیانداری گرۆژی›.

**گروهک** / gurûhak, gorûhak ، ـها/: /اسم. [تعریض] گرۆهەک؛ گرووهەک؛ پارت یان گرۆپێکی ڕامیاری بچووک و بێبایەخ.

**گروهکی** / gurûhakî, gorûhakî/: صفت. گرۆهەکی: ۱. سەر بە گرووهەک ۲. ـها/ ئەندام یان لایەنگری گرۆیەکی بچووک و بێ بایەخ.

**گروەگرایی** / gurûhgerāyî, gorûhgarāyî ، ـها/: /اسم. دەستەوگری؛ دەستەخوازی؛ خوازیاری داهێنانی دەستەیەکی تازە یان هاوڕێ بوون لەگەڵ گرۆیەک.

**گروهی**[1] / gurûhî, gorûhî/: /اسم. گرۆیی؛ دەستەیی؛ کۆمەڵی؛ تاقمی؛ سەر بە گرۆ ‹منافع گروهی: قازانجی گرۆیی›.

**گروهی**[2]: قید. گرۆیی؛ بە دەستە؛ بە کۆمەڵ؛ گوردمگوردی؛ بە شێوەی گرۆ ‹بچەها گروهی رفتند پیش مدیر: منداڵەکان گرۆیی چوون بۆ لای بەڕێوەبەر›.

**گروی** / gerovî/: /اسم. بەبارمتە؛ گرەوینە؛ گرەوەک؛ ئەوەی لە گرێوی شتێکدا گل دەدرێتەوە ‹شناسنامه را گروی نگهداشت: پێناسەکەی بەبارمتە هەڵگرت›: **گرویی**

**گرویدن** / geravîdan/: مصدر. لازم. // **گرویدی:** پرەنگیت؛ **می گروی:** دەپرەنگی؛ **بگرا:** بپرەنگە // پرەنگین؛ ڕاهاتن: ۱. بڕوا/ باوەڕ (پێ)هێنان؛ پاڵدان؛ بڕوا کردن؛ گرتنە بەر؛ ئیمان هاوردن؛ شوێنی بڕوا یان دینێک کەوتن ‹به اسلام گرویدن: بە ئیسلام بڕوا هینان› ۲. ئۆگر/ هۆگر بوون؛ خوو پێگرتن؛ هۆگرتن؛ دڵ پێوە بوون یان ئۆگرەتی بە ئاکارێک ✽ **گراییدن**. هەروەها: **گرویدنی**

■ صفت فاعلی: **گرونده** (ـ)/ صفت مفعولی: **گرویده** (پرەنگاو)/ مصدر منفی: **نگرویدن** (نەپرەنگین)

**گرویی** / geroyî/ ☜ **گروی**

**گره** / gere(h) ، ـها/: /اسم. گرێ: ۱. بەند؛ خەربۆک؛ قەرقەف؛ چۆنیەتی ئاڵۆز بوون و قەمچ خواردن و لێکگیرانی یەک یان چەند هەودا پێکەوە ‹گره زدن: گرێ دان› ۲. لک؛ لکە؛ بەند؛ گرێک؛ سوو؛ چووکڵ؛ گرە؛ هەڵتۆقانی وا بەدیهاتوو ‹گرەی نخ: گرێی بەن› ۳. [مجازی] گیر؛ گرفت؛ گیر و گرفت؛ پەتەر؛ تەگەر؛ تەگەرە؛ گریشە؛ ئەوەی ئەستەم ڕێبەڕێ دەبێ ‹گره کار: گیری کار› ٤. گرە؛ یەکەی درێژایی لە دەریا بەرامبەر بە یەک میلی دەریایی ‹گره دریایی: گرەی دەریایی› ۵. [گیاەناسی] لک؛ لکە؛ گچ؛ شوێنی دەرهاتنی لق لە کۆتەی دار ٦. [گیاەناسی] گۆ؛ گۆپکە؛ شوێنی شین بوونی گەڵا لە سەر لقی دار ۷. [کالبدشناسی] لک؛ لکە؛

تۆپەڵەی تۆکمە و بچووک لە خانەگەلی دەماری و شانەییدا.

▣ **گره پاپیونی:** گرێ پاپیونی؛ گرێیەکی دوولایی بە شێوەی باڵی پەپوولە.

**گرەی کور:** گرێ پووچکە؛ گرێ کۆرە؛ گرێ/ گرێیە کوێرە؛ لکە کۆرە؛ لکە کۆرێ؛ گرێ کۆڵە؛ گرێشک؛ گرفنج؛ گرفنچ؛ گرێکوتک؛ کۆڵە گرەوچ؛ گرێیەکی وا کە هاسان نەکرێتەوە.

▣ **گره از کار کسی گشودن/ باز کردن:** *[مجازی]* کەل کەسێ گرتن؛ سەر بەن بۆ کەسێ گرێ دان؛ گرێ لە کاری کەسێ کردنەوە؛ گیر و گرفتی کەسێ چارەسەرکردن.

**گره بر ابرو افکندن:** *[مجازی]* ناوچاو تورشاندن؛ ناوچاو تاڵ/ لۆچ‌کردن؛ ناوچاو دانە یەکا؛ نارەزایی یان تووڕەیی خۆ نیشاندان.

**گره خوردن:** گرێ تێکەوتن؛ پێچ خواردن: ۱. ئاڵۆزان و لێک‌گیران؛ لکەنەکەوتەی ‹نخ گره خورده بود: بەنەکە گریی تێکەوتبوو› ۲. *[مجازی]* هەبلین؛ هەربلین؛ تێکچوون؛ لکە واردەی؛ لکە کەوتەینە؛ بە شێوەی دژوار دەرهاتن ‹گره خوردن کار: پیچ خواردنی کار›.

**گره را با دندان باز کردن:** *[کنایی]* ئیشی دەستان خستنە ددان؛ گرێ دەس خستنە دیان؛ بە زۆر، ملهوڕی و تووڕەیی کارێ‌کردن ‹هر گرهی را که با دندان نباید باز کرد: ئیشی دەستان مەخە ددان›.

**گره را باز کردن:** گرێ‌کردنەوە: ۱. هەڵوەشاندنەوەی گرێ ۲. *[مجازی]* چارکردن؛ گیر و گرفتێک چارەسەر کردن.

**گره زدن:** گرێ دان؛ گرێ لێدان؛ لکە دەی/ دای ‹تو کراوات را خوب گره می‌زنی، بگیر این را برایم گره بزن!: تۆ کراوات جوان گری دەدەی، هانێ ئەمەم بۆ گرێ دە!›.

**گرەگشا / gere(h)gošā** ، ـیان/: *صفت.* کارساز؛ چارەدۆز؛ بەکەڵک؛ بە لێهاتوویی یان توانستی لابردنی گیر و گرفت و دژواری ‹همکاری شما خیلی گره‌گشا بود: هاوکاریتان زۆر کارساز بوو›.

**گرەگشایی / gere(h)gošāyî** ، ـها/: *اسم.* کارسازی؛ چارەدۆزی: ۱. کار یان ڕەوتی کردنەوەی گرێ ۲. *[مجازی]* کار و ڕەوتی ڕێبەڕێ‌کردن و چارکردنی گیر و گرفت.

**گری [1] / garî**/: *اسم.* گەڕی؛ گرۆی؛ گەڕۆڵی؛ نەخۆشی گڕۆیی؛ جۆرێ نەخۆشی پێستە کە وەرینی ناوەناوەی موو، ئاڵۆش و برێ‌جار برینی لەگەڵدایە.

**ـگری [2]**: *پسوند.* ـگەری؛ـکەری: ۱. ـکاری؛ـ بازی؛ پاشگری خاوەن بوون ‹توانگری: توانگەری› ۲. کردنی کارێک یان هەبوونی پیشەیەک ‹کارگری: کاریگەری› ۳. دروست‌کردن یان کارکردن بە شتێک ‹آهنگری: ئاسنگەری›.

**گریان [1] / geryān**/: *صفت.* بە گریان؛ گریان؛ گرینۆک ‹چشمِ گریان: چاوی بە گریان›.

**گریان [2]**: *قید.* بە گریانەوە؛ بە گیریانەو؛ گرەوەگرەو؛ کارەکار؛ (بە) گریان-گریان ‹گریان پیشم آمد و از کارش توبه کرد: بە گریانەوە هاتە لام و لە کردەوەی خۆی تۆبەی کرد›.

**گریاندن / geryāndan**/: *مصدر. متعدی.* // **گریاندی:** گریاندت؛ **می گریانی:** دەگریێنی؛ **بگریان:** بگریێنە// گریاندن؛ گیریاندن؛ گرەونەی؛ گراونەی؛ گراونای؛ کردنە گریانەوە/ گریەوە؛ هێنانە/ کردنە گریان ‹با آواز سوزناکش حاضران را گریاند: بە گۆرانی بە سۆزی هەمووی کردە گریانەوە›: **گریانیدن.** هەروەها: **گریاندنی**

■ صفت فاعلی: **گریاننده** (ــ)/ صفت مفعولی: **گریانده** (ـ)/ مصدر منفی: **نگریاندن** (نەگریاندن)

**گریانیدن / geryānîdan**/ ☜ **گریاندن**

**گریبان / gerîbān, garîbān** ، ـها/: *اسم. [ادبی]* بەرۆک؛ بەرەک؛ یەخە؛ ئیخە؛ ملیوان؛ ملشۆ؛ بەرکۆژە؛ قەرپک؛ پێسیر؛ وەروەرە؛ بەر ئێخە؛

کۆژە؛ بەرو؛ گومی؛ قەلان؛ قەمت؛ یەقە؛ زی؛ پستو؛ سوکر؛ یاخە؛ خڕ؛ بەروا؛ ئەو بەشە لە جل کە سەرسینگ و دەوری مل دەگرێ، بەتایبەت پێشەوەی.

**گریبانگیر** / gerîbāngîr, garîbān- /: *صفت.* تووشیار؛ دوچار؛ ئاوقا؛ هاوقا؛ داوێنگیر؛ تووشهاتوو.

⊡ **گریبانگیر شدن:** تووشیار/ تووش بوون؛ گیرۆدە بوون؛ ئاوقا بوون ‹دو سال است یک همسایەی نااهل گریبانگیر او شده است: دوو ساڵە هاوسایەکی ناڵەبار توشیاری بووە›.

**گریپ** / girîp, g(e)rîp /: [فرانسوی]*اسم.* پەتا: ۱. پەرکەم؛ ئامفولۆئانزا ۲. *[گفتاری]* درم؛ ئەلامەت؛ هەلامەت؛ هالمەوت؛ ئارسم؛ ئاسرم؛ پەسیو؛ پەسیڤ؛ پەرسیف؛ پسکە؛ نەکسۆ؛ مرک؛ پەرسیو؛ فرفینگ؛ دەمەنی؛ زەکەم؛ زوکام.

**گریپفروت** / gereypfurût, greypfrût ، ـها/: [انگلیسی]*اسم.* گریپفرووت: ۱. داری خڕ و کورتەباڵای گریپفرووت لە تیرەی مزرەمەنی ۲. مێوەی مزر و بۆنخۆشی ئەو دارە.

**گریختن** / gorîxtan /: *مصدر. لازم. [ادبی]*// **گریختی:** هەڵاتی؛ **می گریزی:** هەڵدێی؛ **بگریز:** هەڵێ// هەڵاتن؛ دەرچوون؛ پەکین؛ وەزین؛ تێ‌تەقاندن؛ هەڵهاتن؛ ڕاکردن؛ تەورین؛ تەقین؛ هەڵفرتیان؛ ڕەمەی؛ ڕەمای؛ واین؛ بەرشیەی ‹از زندان گریختن: لە بەندیخانە هەڵاتن›. هەروەها: **گریختنی**

■ **صفت فاعلی: گریزنده** (ـ)/ **صفت مفعولی: گریخته** (هەڵاتوو)/ **مصدر منفی: نگریختن** (هەڵنەهاتن)

**گریدر** / g(e)rîder ، ـها/: [انگلیسی]*اسم.* گرەیدر؛ ماشینی گەورەی ڕێ و بان، بە تێخەیەکی زەلام لە نێوان دوو تەگەرەی بەر و دواوە، بۆ تەخت و ترازکردنی زەوی.

**گریز** / gorîz ، ـها/: *اسم. [ادبی]* هەڕا؛ ڕا؛ غار؛ خار؛ لینگ؛ هەلینگ؛ وەز؛ کار و ڕەوتی هەڵاتن؛ ڕەڤاندن؛ قاچان؛ دەرچوون.

⊡ **گریز زدن:** *[مجازی]* بڕ لێدان؛ ئاڵوگۆڕێکی کوتوپڕی و خێرا تێپەڕ هێنانە ئاراوە (بەتایبەت لە قسەدا) ‹گریزی هم بە قضیەی خواستگاری سارا زد: بڕیکیشی بۆ کێشەی داواکاری سارا لێدا›.

**گریزان**[1] / gorîzān /: *صفت. [ادبی]* وەڕەز؛ بێزار؛ هەراسان ‹از درس گریزان است: لە دەرس وەڕەزە›.

**گریزان**[2]: *قید. [ادبی]* بە هەلات ـ هەلات؛ بە ڕا کردن؛ بە هەڕا ـ هەڕا؛ لە حاڵی ڕاکردندا ‹گریزان خود را بە شهر رساند: بە هەلات ـ هەلات خۆی گەیاندە شار›.

**گریزاندن** / gorîzāndan /: *مصدر. متعدی. [ادبی]*// **گریزاندی:** تاراندت؛ **می گریزانی:** دەتارێنی؛ **بگریزان:** بتارێنە // تاراندن؛ تاران: ۱. بێزاندن؛ ڕەواندن؛ ڕەڤاندن؛ جەنیقاندن؛ بێزار/ وەڕەزکردن ‹گریزاندن دوستان: تاراندنی دۆستان› ۲. ڕاو نان؛ هەڕا دان؛ ڕەماندن ‹گریزاندن دشمن: ڕاو نانی دژمن›: **گریزانیدن**. هەروەها: **گریزاندنی**

■ **صفت فاعلی: گریزاننده** (تارێنەر)/ **صفت مفعولی: گریزانده** (تارێنراو) / **مصدر منفی: نگریزاندن** (نەتاراندن)

**گریزانیدن** / gorîzānîdan / ☜ **گریزاندن**

**گریزپا** / gorîzpā ، ـها؛ ـیان/: *صفت. [ادبی]* خاوەن خدەی خۆ نەگرتن لە شوێنێکدا.

**گریس** / girîs, g(e)rîs /: [انگلیسی]*اسم.* گریس؛ ماکی نیوەگرسی دەلەمە بۆ ڕەوانسازی بەشگەلی لە جووڵەی ماشین.

**گریستن** / gerîstan /: *مصدر. لازم. [ادبی]*// **گریستی:** گریای؛ **می گریی:** ئەگری؛ **بگری:** بگری // گریان؛ گیریان؛ گیران؛ گرین؛ گیرین؛ گرەوەی؛ گرەوای؛ گرێوان؛ زمین؛ بشکانن؛ گریسن ‹بە حال خود گریستن: بە حاڵی خۆ گریان›. هەروەها: **گریستنی**

■ **صفت فاعلی: گرینده** (ـ)/ **صفت مفعولی: گریسته**

(گریاو)/ مصدر منفی: **نگریستن** (نەگریان)

**گریسکاری** / girîskārî, g(e)rîs-/: [انگلیسی/ فارسی]/اسم. گریسکاری؛ کار و ڕەوتی ساوینی گریس بە پاژگەلی لە جوولەی ماشیندا.

**گریم** / girîm, g(e)rîm ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. گریم؛ گۆڕانی شێوەی سەر و چاو بە شێوازی دلخواز، پتر بۆ بەڕێوە بردنی شانۆ ‹هنرپیشەی زن را چە خوب گریم کردە بودند: شانۆگەرە ژنەکەیان چەند باش گریم کردبوو›.

**گریمور** / girîmor, g(e)rîmor ، ـها/: [فرانسوی] /اسم. گریمۆڕ؛ کەسێ کە کاری گریم کردنە ‹گریمور در کارش خیلی ماهر بود: گریمورەکە لە کاریدا زۆر لێهاتوو بوو›.

**گرین** / g(e)reyn/: [؟] ☜ **گندم-٣**

**گریوە** / garîve/:/اسم. کەل؛ ملە؛ گەردەنە؛ باریکە ڕێی تەنگەبەر و پێچەلپێچی کوێستانی.

**گریە** / gerye ، ـها/:/اسم. گری؛ زمی؛ گیە؛ گریوە؛ گرێوە؛ گرەوە؛ گریس؛ بنوک؛ ڕژانی فرمێسک لەبەر ژان، خەم یان خۆشحالی.

▣ **گریە داشتن**: گریان ویستن؛ شیاوی گریان بوون؛ پێویست بە گریان بوون ‹کارهای تو واقعا گریە دارد: کارەکانی تۆ بە ڕاستی گریانی دەوێ›.

**گریە کردن**: گریان؛ زاری‌کردن؛ گریوەکردن؛ گری کرن؛ گرەوەی؛ گیریان؛ وەقانن؛ فرمێسک/ ئەسرین ڕژاندن؛ هەرس متەی ‹بچە گرسنە است، دارد گریە می‌کند: منداڵەکە برسیەتی، خەریکە نەگری›.

**گریە گرفتن**: ١. دەست کردنە گریان؛ دەس کەردە گرەوەی؛ دانە قولپەی گریان ‹وقتی خبر را شنید گریەاش گرفت: کاتێ کە هەواڵەکەی بیست دەستی کردە گریان› ٢. گریان هاتن؛ گرەوە ئامەی/ ئامای ‹گریەام می‌گرفت: گریانم دەهات›.

**بە گریە افتادن**: بوونە گریانەوە؛ کەوتنە گریان؛ بوونە گریەوە ‹از گریەی او همە بە گریە افتادند: لە گریانی ئەو هەموو بوونە گریانەوە›.

**بە گریە انداختن**: کردنە گریانەوە/ گیریانەو؛ کرنە گریەوە؛ گراونەی ‹بچە را اذیت کردی و بە گریە انداختی: منداڵەکەت ئاڕاند و کردتە گریانەوە›.

**گریە کنان** / geryekonān/: قید. بە گریانەوە؛ گریان-گریان؛ بە گریان ــ گریان؛ گرەوەگرەو ‹گریەکنان خود را بە آغوش مادرش انداخت: بە گریانەوە خۆی خستە ئامێزی دایکی›.

**گریە و زاری** / gerye-o-zārî/:/اسم. شین و شەپۆڕ؛ گریان و شیوەن؛ شین و گریان؛ گریان و نالان؛ شین و ڕۆــڕۆ؛ زمی و نالە؛ شین و زاری؛ گریە و گۆ؛ گری و گاو ‹گریە و زاری فایدە ندارد: شین و شەپۆڕ سوودێکی نیە›.

**گز** [1] / gaz/:/اسم. گەز: ١. [قدیمی] گاز؛ گەزە؛ یەکەی درێژایی نزیک بە یەک میتر ٢. /ـها/ جۆرێک شیرینی کە لە شیرەی گیای گەز دروستی دەکەن ٣. /ـها/ گز؛ گزم؛ دار گەزۆ؛ گزگەجاڕ؛ گزیە چار؛ شوتیەدار؛ جۆرێک دەوەنی جوان بە گەڵای نوک‌تیژ و گوڵی وردەوە کە لە ساقەتەکەی شیرەی گەز دێتە دەر.

▣ **گز کردن**: گەزکردن؛ پێوان؛ درێژایی شتێک ئەندازەگرتن ‹کار گز کردن پارچەها تمام شد: کاری گەز کردنی پارچەکان تەواو بوو›.

**گز نکردە پارە کردن**: [کنایی] بێ فوو لە دۆ کردن؛ هەروا بە هەڵەڕۆیی و بێ‌لێکدانەوە کاری‌کردن ‹چرا اینقدر بی‌فکری؟ باز گز نکردە پارە کردی و حرف زدی!؟: بۆچی ئەوندە هەڵەی؟ دیسانەکە بێ‌فوو لە دۆ کردن قسەت کرد؟!›.

**ـ گز** [2]: پیوازه. ـ گەز؛ ـ گەس؛ گەزەندە؛ گەزندە ‹غریبگز: غەریبگەز›.

**ـ گزار** / gozar/: پیوازه. ١. ــ گێر؛ ـ کەر؛ ـ پێک‌هێن؛ ئەنجامدەر ‹کارگزار؛ نمازگزار: کارگێر؛ نوێژکەر› ٢. ــ لێکدەر؛ ڕاڤەکار ‹خوابگزار: خەولیکدەر›.

**گزاردن / gozardan/**: *مصدر. متعدی.* // **گـزاردی:** به جێت‌هێنا؛ **می‌گزاری:** به جێ‌دێنی؛ **بگزار:** به جێ بێنه// ١. بەجێ‌هێنان؛ جێبەجێ‌کردن؛ بەگا ئاردەی؛ کردن؛ کەردەی؛ بجەئینان ‹نماز گزاردن: نوێژ بەجێ‌هێنان› ٢. دانەوە؛ پێدان؛ داپنەی ‹وام گزاردن: قەرز دانەوە› ٣. لێکدانەوە؛ وەرگەڕاندن؛ شرۆڤەکردن ‹خواب گزاردن: خەو لێکدانەوە›.

هەروەها: **گزاردنی**

■ صفت فاعلی: **گزارنده** (بە جێ‌هێنەر)/ صفت مفعولی: **گزارده** (بە جێ‌هێنراو)/ مصدر منفی: **نگزاردن** (بە جێ‌نەهێنان)

**گـزارش / gozāreš** ، ـها/:*اسم.* گوزارش؛ گوزارشت: ١. ـ/ها/ گرێ‌بەند؛ ڕاپۆرت؛ بەدی؛ کار و ڕەوتی خەبەر دان؛ جوڕەنان؛ گەڕاندنەوەی ڕووداوێک ‹گزارش مستقیم: خەبەر دانی ڕاستەوخۆ› ٢. نامیلکەیێ کە خوێندکار یان تۆژەر لەمەڕ لێکۆڵینەوەکەیەوە دەینووسێ ٤. *[ادبی]* پاچڤە؛ وەرگێڕاو؛ وەرگێڕاوە.

▣ **گـزارش دادن:** خەبەر دان؛ هەواڵ دان؛ گوزارشت دان؛ ڕاپۆرت دان ‹تا حرفی می‌زدیم می‌رفت گزارش می‌داد: تا شتێکمان دەگوت فت خەبەری دەدا›.

**گـزارش کـردن:** ڕاگەیاندن؛ گێڕانەوە؛ گەڕاندنەوە؛ گوزارشت‌کردن ‹گزارشگر جریان مسابقه را گزارش کرد: هەواڵدەر ڕەوتی کێبەرکێکەی ڕاگەیاند›.

**گزارشگر / gozārešgar** ، ـها؛ ـان/:*اسم.* هەواڵدەر؛ هەواڵنێر؛ پەیامنێر؛ هەواڵگێڕ؛ خەبەرنیگار؛ ئەوەی خەریکی نووسین و ڕاگەیاندنی هەواڵە.

**گزارشگری / gozārešgarî/**:*اسم.* هەواڵدەری: ١. کار و ڕەوتی هەواڵ نووسین و ڕاگەیاندنی هەواڵ ٢. پیشەی هەواڵدەر.

**گزارنده / gozārande** ، ـگان/:*اسم. [قدیمی]* وەرگێڕ؛ پاچڤەکار؛ کەسێ کە نووسراوەیەک لە زمانێکەوە دەکاتە زمانێکی‌تر.

**گزاره / gozāre** ، ـها/:*اسم.* گوزارە: ١. *[منطق]* ڕستەیەکی هەواڵی، دروست یان نادروست ٢. *[دستور]* هەواڵ؛ خەبەر؛ دوامین بەشی ڕستە کە لەمەڕ بنڕستەوە ئاگاداری دەدا ٣. بژارە؛ پایژی؛ ڕاڤە؛ ڕاژە؛ شرۆ؛ شرۆڤە؛ کار و ڕەوتی لێکدانەوە و کۆڵینەوەی شت یان مەبەستێک.

**ـگزاری / gozārî/**: *پسوازه.* ١. ـگێڕی؛ ـکەری؛ ـ پێک هێنی ‹کارگزاری: کارگێری› ٢. ـلێکدەری ‹خوابگزاری: خەولێکدەری›.

**گزاف / gazāf/**: *صفت.* گەزاف؛ زافزاف؛ بێداد؛ بێدا؛ زێدە؛ زەبەند؛ زاف؛ زاڤ؛ لەڕادەبەدەر.

**گزافه / gazāfe** ، ـها/:*اسم.* وڕ؛ کووش؛ شروت؛ شات‌وشووت؛ شووتە؛ چاووڕاو؛ چاپ و چوپ؛ چرپ و چاپ؛ قسەی گەزاف.

**گزافه‌گو / gazāfegû** ، ـها؛ ـیان/: *صفت.* وڕبێژ؛ ولەوێژ؛ لافی؛ شات‌وشووت‌کەر؛ فشەکەر؛ پەرووزن؛ چرپ‌وچاپکەر؛ پڕشات‌وشووت؛ بە چرپ و چاپ؛ بە قسەی گەزاف ڕاهاتوو.

**گزافه‌گویی / gazāfegûyî** ، ـها/:*اسم.* وڕبێژی؛ ولەوێژی؛ شات‌وشووت‌کەری؛ فشەکەری؛ گەزالی؛ کار یان ڕەوتی قسەی سەیری تێکەڵ بە درۆ کردن.

**گزانگبین / gazangabîn/**: [از کردی]*اسم.* گەزۆ؛ گەزوو؛ گەزوە؛ گەزگولە؛ گەزولە؛ گەز؛ شیرینە؛ شۆکە؛ شۆک؛ شیلەی داری گەز بە ڕەنگی سپی ئاماڵ زەرد و تامی تۆزێ تاڵ کە جۆرێ شیرینی لێ‌دروست دەکرێ.

**گزر / gazar** ، ـها/: [کردی]*اسم.* گزەر؛ گەزەر؛ گێزەر؛ گزر؛ گەزەرگ؛ کارووت؛ کارۆت؛ بنەگیایەکی درێژۆکەی گرۆڤەرە بە ڕەنگی زەرد و نارنجی کە دەخورێ.

▣ **گزر دشتی:** ڕکۆکی؛ چەپۆلە؛ گێزەرۆکە؛ گێزەرەدەشتی؛ گەزەرە کێویلە؛ گێزەری دەیمی؛ گیزەری زیر؛ گێزەری سپی؛ گزەرگە

سیاوی؛ گزەرگە دێمی؛ گیایەکی شقشینک یان دوو سالان، بە بنجاری سپی و ئەستوور و گەلای بۆنخۆشەوە.

**گزستان** / gazestān/:اسم. گەزجار؛ گزجار؛ گزگ‌جار؛ بێشەی دەوەنی گز.

**گزش** / gazeš/:اسم. وەزە؛ گەز؛ کار و ڕەوتی گەزتن؛ گەستن؛ گەژین؛ گەزکرن؛ گەستەی؛ گەسەی ‹گزش عقرب: گەستنی دووپشک›.

**گزک** / gazak ، ـها/:اسم. ١. دەرفەت؛ هەل؛ چەل؛ هۆ؛ گورد؛ بووز ٢. نۆبە؛ سەرە؛ نەوگە؛ نۆرە (بەتایبەت نۆرەئاو).

◘ **گزک به دست کسی دادن**: دار بەدەم کەسێکەوە دان؛ بیانوو دانە دەست کەسێکەوە؛ هەل و دەرفەتی کەلکوەرگری بە ناڕەوا بۆ کەسێ ڕەخساندن ‹با این کارها که می‌کنی گزک به دست همسایه‌ها می‌دهی تا پشت سرت حرف بزنند: بەم کارانە دەیکەی دار ئەدەیتە دەم دراوسیکانەوە پشتەسەرت قسە بکەن›.

**گز ـ گز** / gezgez ، ـها/:اسم.[گفتاری] تەز؛ مرووژیانە؛ مرۆچانە؛ تۆس؛ ژانی دەرزیاژن لە دەست و پێ لە بەر نەجوولان.

**گزلیک** / gezlîk, gazlîk ، ـها/: [ترکی]/اسم. گەزلک؛ گەرلک؛ چەقۆی دەنووک چەماوە بۆ هەلکلۆشانی شتێ.

**گزمه** / gazme ، ـها؛ ـگان/: [ترکی]/اسم.[قدیمی] چەرخەیی؛ گەزمە؛ شەڤدە؛ عەسەس؛ پاسەوان؛ کێشکچی شەوانەی بازاڕ و کۆلانان.

**گزن** / gazan ، ـها/:اسم. ئامێری دەم‌تیژی ئاسنین بۆ برین و تاشینی چەرم.

**گزند** / gazand ، ـها/:اسم.[ادبی] وەزەن؛ وەزەنگ؛ گەزەن؛ زیان: ١. ئازار؛ تەوەرە؛ تەگەرە؛ تەمەرە؛ ئاسیو؛ عەزیەت؛ بەلا ٢. زەرەر؛ زان؛ خەسار؛ نەستیل؛ پێوەر.

**گزنده** / gazande/:صفت. گەزندە؛ گەزنەنە: ١. ـگان/ گەزۆک؛ گەزە؛ گازگر؛ گەزەک ‹حشره‌ی گزنده: مێرووی گەزنە› ٢. [مجازی] تفت و تاڵ؛ زۆر ئازاردەر و کاریگەر لە سەر ڕۆح یان گیان ‹حرف گزنده: قسەی گەزندە›.

**گزنون** / g(e)zenon/: [فرانسوی]/اسم. گزینون؛ توخمی کیمیایی بە ژمارە ئەتومی ٥٤ و کێشی ئەتومی ١٣١٫٣٠ کە گازێکی نادرە، تێکەڵی ئاو نابێ و بە ڕێژەیەکی زۆر کەم لە کەشدا هەیە: **زنون**

**گزنه** / gazane ، ـها/:اسم. دەسخورێن؛ دەسخورێنە؛ خەلەنگ؛ دورزیلە؛ گەزنە؛ گەزەنە؛ گەزەنێ؛ گەزنک؛ گەزینک؛ گەزگەزک؛ گەزگەسک؛ گەزگەزۆک؛ گەزگەزکە؛ گەزۆک؛ گەسگەسک؛ گزگز؛ گزگزە؛ ئالۆشە؛ گیایەکی ئالیکی بە گەلا و لاسکی کورکنەوە، لە پێست کەوێ دەیچووزێنێتەوە: **انجره**

**گزیدگی** / gazîdegî ، ـها/:اسم. گەزراوی؛ گەستەیی؛ چزیاگی.

**گزیدن** / gazîdan/: مصدر. متعدی. // **گزیدی**: گەستت؛ **می‌گزی**: دەگەزی؛ **بگز**: بگەزە// گەستن؛ گەزین؛ گەزتن؛ گەژین؛ گەستەی؛ گەسەی؛ وەزەی؛ گرەوتش: ١. گازگرتن؛ چزاندن؛ ڤەگەزاندن؛ چزنەی؛ تێچەقاندنی چز یان ددان ٢. [مجازی] چزاندن؛ چزنەی؛ بە قسەی تاڵ و تفت ئازاردن. هەروەها: **گزیدنی**

■ صفت فاعلی: **گزنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **گزیده** (گەزتراو)/ مصدر منفی: **نگزیدن** (نەگەزتن)

**گزیدن** / gozîdan/: مصدر. متعدی.[ادبی]// **گزیدی**: هەڵتبژارد؛ **می‌گزینی**: هەڵدەبژێری؛ **بگزین**: هەڵبژێرە// هەڵبژاردن؛ بژاردن؛ بژانن؛ وەژاردن؛ وەژارتن؛ وژاندن؛ نەقاندن؛ هەلاواردن؛ چنیەی؛ هۆرچنیەی؛ گولبژێرکردن؛ تەلبژێرکردن.

■ صفت فاعلی: **گزیننده** (ـ)/ صفت مفعولی: **گزیده** (هەڵبژێراو)/ مصدر منفی: **نگزیدن** (هەڵنەبژاردن)

**گزیده** / gozîde ، ـها؛ ـگان/: صفت. بژاردە؛ هەڵبژاردە؛ هەڵبژێراو؛ تلژین؛ هۆرچنیا؛

نەقاندی؛ تڵ؛ سەرەتا؛ سەرشڤ؛ سەرتڵ؛ شیاوی هەڵبژاردن ‹کتاب گزیده: پەرتووکی بژاردە›.

**گزیر** / gozîr/: *اسم. [ادبی]* چارە؛ ڕێگەی نەجات ‹از این کار گزیری نیست: چارەیەک بۆ ئەم کارە نیە›.

**گزینش** / gozîneš ، ـها/: *اسم.* هەڵبژێری؛ هەڵاوێری؛ تەڵبژێری: ۱. کار و ڕەوتی هەڵبژاردن؛ بژاردن؛ نەقاندن؛ هەڵاواردن ‹گزینش دانشجو: هەڵبژێری خوێندکار› ۲. مەزرینگە یان بەشێک لە ڕێکخراوە بۆ هەڵبژاردن و گلدانەوەی کەس یان کەسانێک لە بوارێکی تایبەتدا.

**گزینه** / gozîne ، ـها/: *اسم.* ۱. گوڵبژێر؛ گوڵچین؛ گوڵچن؛ تەڵبژێن؛ کۆمەڵە نووسراوەی هەڵبژاردە ‹گزینەی ادب کردی: گوڵبژێری وێژەی کردی› ۲. تەڵ؛ هەر کام لە وەرامەکانی ئەزموونی تێست ۳. تەڵ؛ هەر کام لەو شت یان چارانە کە بۆ هەڵبژاردن دەبێ.

**گس** / gas/: *صفت.* تفت؛ گیر؛ پز؛ ڕوپ؛ تامی گیر و دەم وشکەوەکەر (وەک تامی سنجووی کاڵ).

**ـ گسار** / gosār/: *پیوازه. [ادبی]* ـ خۆر ‹میگسار: مەیخۆر›.

**گساردن** / gosārdan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**گساردی**: خواردتەوە؛ **می‌گساری**: دەخۆیەوە؛ **بگسار**: بخۆرەوە // خواردنەوە؛ خواردن؛ فڕکرن؛ نۆشین؛ نۆشان؛ نۆشای.

**ـ گساری** / gosārî/: *پیوازه.* ـ خۆری ‹غمگساری: خەمخۆری›.

**گستاخ** / gostāx ، ـها؛ ـان/: *صفت. [ادبی]* گوساخ؛ گوستاخ: ۱. ڕێلاس؛ ڕووداماڵیاگ؛ ڕووداماڵراو؛ ڕووداماڵاو؛ ڕوودار؛ ڕاڕ؛ گۆسارتمە؛ کەلپزا؛ کەلپزە؛ کولەش؛ کۆڕجوو؛ بێشەرم و حەیا؛ شەرمنەکەر؛ ڕووقایم؛ بەیتەشە؛ باتیزۆ؛ باتیزۆک؛ چوختی؛ چەختی؛ بەقلیسۆک ۲. چاونەترس؛ نەترس؛ دەڵ؛ دەمسوور ۳. ڕێلاس؛ ڕووداماڵیاگ؛ دەڵوقەڵ؛ شەرمنەکەر؛ چەقاوەسۆ؛ چەقەسۆ؛ چەتاوەڕوو؛ بێئەدەب.

**گستاخانه**[1] / gostāxāne/: *صفت.* بێشەرمانە؛ ڕوودارانە؛ ڕێلاسانە؛ گوستاخانە ‹رفتار گستاخانه: کردەوەی بێشەرمانە›.

**گستاخانه**[2]: *قید.* بێشەرمانە؛ ڕوودارانە؛ ئاوێتە بە گوستاخی و بێ شەرمیەوە ‹گستاخانه پوزخندی زد و رفت: بێشەرمانە زەردەخەنەیەکی کرد و ڕۆیشت›.

**گستاخی** / gostāxî ، ـها/: *اسم.* گوستاخی؛ گوساخی؛ ڕووداری؛ ریلاسی؛ گۆرساقی؛ کردەوەی دوور لە ئەدەب ‹اگر بخواهی گستاخی کنی می‌اندازمت بیرون: گەر بێتوو گوستاخی بکەی دەتکەمە دەرەوە›.

**ـ گستر** / gostar/: *پیوازه.* ـ پەرەدەر: ۱. ـ پەروەر؛ برەوپێدەر؛ پەرەپێدەر ‹دادگستر: دادپەروەر› ۲. ـ دادەر؛ ـ ڕاخەر؛ بڵاوکەرەوە ‹سایەگستر: سێبەردادەر›.

**گستراندن** / gostarāndan/: *مصدر. متعدی.* // **گستراندی**: پەرەت دا؛ **می‌گسترانی**: پەرە دەدەی؛ **بگستران**: پەرە بدە // ۱. پەرە دان؛ پەرە پێدان؛ بڵاوکردنەوە؛ برەو پێدان ۲. ڕاخستن؛ پان کردنەوە؛ بەربڵاوکردن؛ ئەرەیاوەی * **گسترانیدن**. هەروەها: **گستراندنی**

■ صفت فاعلی: **گستراننده** (پەرەدەر)/ صفت مفعولی: **گسترانده** (پەرەدراو)/ مصدر منفی: **نگستراندن** (پەرە نەدان)

**گسترانیدن** / gostarānîdan/ ☜ **گستراندن**

**گستردگی** / gostardegî ، ـها/: *اسم.* بەربڵاوی؛ پەرەداری؛ پانی؛ پان‌وبەرینی ‹گستردگی فاجعه به حدی است که نمی‌توان توصیف کرد: بەربڵاوی کارەساتەکە هێندە زۆرە لە باس نایە›.

**گستردن** / gostardan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**گستردی**: ڕاتخست؛ **می‌گستری**: ڕادەخەی؛ **بگستر**: ڕاخە // ۱. ڕاخستن؛ فەرش کردن؛ پان

کردنـەوە؛ پانـەوکـردن؛ داخسـتن؛ ئـەرەیاوەی؛ یاوایرە؛ تەپساندن؛ ڕامداندن؛ ڕامەزانـدن؛ ڕادان؛ ڤەکشاندن؛ داکێشان؛ بلاوکردنەوە ‹قالی گستردن: قالی ڕاخستن› ۲. پەرە پێدان؛ پەرە دان؛ بەربلاو کردنەوە؛ برەو/ ڕمێن/ ڕەواج پێدان؛ گشتی‌کردن ‹دانش گستردن: زانست پـەرە پـێدان› ۳. بـلاو کردنـەوە؛ پەخشـەوکردن؛ هەڵـپرژاندن ‹نـور گستردن: تیشک بلاو کردنەوە›.

■ صفت فاعلی: **گسترنده** (ڕاخەر)/ صفت مفعولی: **گسـتردە** (ڕاخـراو)/ مصـدر منفـی: **نگسـتردن** (ڕانەخستن)

**گسترده** / gostarde/: *صفت.* ۱. بەربلاو؛ پەرەدراو؛ پەرەدار؛ ئەرەیاویا ‹تلاش گسترده: هەوڵی بـەربلاو› ۲. *[ادبی]* داخراو؛ ڕاخـراو؛ پانـەوەکراو؛ ئـەرەوزیا ‹فرش گسترده؛ خوان گسترده: قالی داخـراو؛ سـفرەی ڕاخراو›.

**گسـترش** / gostareš ، ـهـا/: *اسـم.* پـەرە؛ بـرەو؛ ڕمێن؛ ڕەواج؛ گەشە.

▣ **گسترش دادن**: پـەرە پێـدان: ۱. ڕەواج دان؛ برەو پێدان ‹گسترش دادن آزادی‌ها: پەرە پێدانـی ئازادیگەل› ۲. بەربلاوکردن؛ پان و بەرین‌کردن ‹گسترش دادن فعالیّت: پەرە پیدانـی کردوکۆش›.

هەروەها: **گسترش یافتن**

**گسـترە** / gostare ، ـهـا/: *اسـم.* گۆڕەپـان؛ پانـاو؛ پانـایی؛ بـەرینی؛ پانتـایی؛ مەیـدان؛ مـەیان؛ جێگەی تایبەت بۆ جۆرێک چالاکی ‹گسترەی کار ما تا دورترین روستاها بود: گۆرەپانـی چـالاکی ئێمـە دوورترین گوندەکانیشی دەگرتەوە›.

ــ **گسـتری** / gostarî/: *پـێواژە.* ــ بلاوەکـەری؛ بلاوەپێدەری؛ پەرەپێدەری.

**گسسـتگی** / gosastegî ، ـهـا/: *اسـم.* پسـاوی؛ پچڕاوی؛ لێک‌پسـاوی؛ لێـک‌پچـڕاوی؛ قرتـاوی؛ لێک‌بلاوی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی پچـڕان؛ پسـان ‹نباید گذاشت در فرآیند آموزش هیچ‌گونه گسستگی بـه وجـود آیـد: نابـێ ڕێ بـدرێ لـە ڕەوتی فێرکاریـدا هیچ‌جۆرە پسانێک ڕووبدا›.

**گسستن** / gosastan/: *مصـدر. لازم. متعـدی. [ادبـی]* //**گسستی**: قرتای؛ **مـی‌گسـلی**: دەقـرتی؛ **بگسـل**: بقرتە// ◻*لازم.* ۱. قرتان؛ قرتیان؛ قەتیان؛ قەدین؛ بچریان؛ پچڕان؛ بچڕان؛ بـڕان؛ بـڕیان؛ وەرسـان؛ بزدان؛ نسلین؛ کرتان؛ کـەڕان؛ پسـان؛ پسـیان؛ پچڕین؛ لە بەریەک چوونی بـەن و داو ‹گسستن طنـاب: قرتانـی تـەناف› ◻*متعـدی.* ۲. پسـاندن؛ پچڕاندن؛ قرتاندن؛ بچڕانـدن؛ پسـاندن؛ چـڕین؛ پرچنـــەی؛ پـــڕچنای؛ کرتانـــدن؛ کەڕانـــدن؛ قەت‌کردن؛ بڕین؛ بزداندن؛ وەرسـاندن؛ قـەدین ‹بند گسستن: داو پسـاندن› ۳. بـەردان؛ کرتانـدن؛ چـڕین ‹دسـت را از دسـتگیره گسـستن: دەسـت لـە دەسک بەردان› ٤. *[مجازی]* پچڕانـدن؛ پسـاندن؛ بڕین؛ پێوەندی خۆ دەگـەڵ کەسـێ یـان شـتێ نەهێشتن * **گسیختن**. هەروەها: **گسستنی**

■ صـفت فـاعلی: **گسـلندە** (ــ)/ صـفت مفعـولی: **گسستە** (قرتاو)/ مصدر منفی: **نگسستن** (نەقرتان)

**گسستە** / gosaste/: *صفت.* بچـڕاو؛ پچـڕاو؛ پسـاو؛ بچڕیاگ؛ قرتیـاگ؛ وەرسـای؛ شولگسـە ‹طناب گسستە: پەتی پساو›: **گسیختە**

**گسل** [1] / gosal ، ـها/: *اسم. [زمین‌شناسـی]* قەڵـش؛ درز؛ قەڵشت؛ قلاش؛ قەڵەش؛ قەڵەشت؛ تلیشی توێکڵی زەوی و لێک‌ترازانی توێژگەکان: **گسلە**

ـ **گسل** [2]: *پیواژە.* ــ شـکێن؛ ـ پچـڕێن؛ ـ پسـێن؛ ـ وەرسێن ‹عهدگسل: پەیمان‌شکێن›.

**گسـلش** / gosaleš/: *اسـم.* ۱. کـار یـان ڕەوتی پچـڕان؛ لێـک‌پسـان ۲. *[زمـین‌شناسـی]* ڕەوتی ڕوودانی قەڵشت.

**گسلە** / gosale/ ☜ **گسل** [1]

ـ **گسلی** / gosalî/: *پیواژە.* ـ پسێنی؛ ــ شـکێنی؛ ــ وەرسـێنی؛ ــ بچـڕێنی ‹پیمـان‌گسـلی: پەیمان‌پسێنی›.

**گسـیختگی** / gosixtegî ، ـهـا/: *اسـم.* پسـاوی؛ پچڕاوی؛ قرتاوی؛ قرتیاگی؛ لێک‌بلاوی.

**گسیختن** / gosîxtan/ ☜ **گسستن**

**گسیخته** / gosîxte/ ☜ **گسسته**

**گسیل** / gosîl/: *اسم.* کار و ڕەوتی ناردن؛ هەناردن؛ بەڕێکردن.

▣ **گسیل شدن**: ۱. ڕەوانە بوون؛ بەڕێ بوون ۲. ڕەوانەکران؛ ناردران؛ ناریان؛ هەناریان؛ وەڕێ کران.

**گسیل کردن**: ناردن؛ هەناردن؛ ڕەوانەکردن؛ بەڕێکردن؛ کیاستن؛ کیاستەی؛ کیانای.

**گسیلیدن** / gosîlîdan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* //**گسیلیدی**: هەناردت؛ **می گسیلی**: دەنێری؛ **بگسل**: بنێرە// هەناردن؛ ناردن؛ ڕەوانەکردن؛ بەڕێ کردن؛ کیاستن؛ کیانای. هەروەها: **گسیلیدنی**

■ صفت فاعلی: **گسلنده** (بەڕێکەر)/ صفت مفعولی: **گسیلیده** (بەڕێکراو)

**ـگشا** / gošā/: *پیوازه.* ـباز؛ ـواز؛ ـ ڤەکر؛ ـکەرەوە؛ ـگوشا؛ ـ ئەوەکەر ‹دلگشا؛ گرەگشا؛ کارگشا: دڵباز؛ گرێڤەکر؛ کارگوشا›.

**ـ گشائی** / gošā'î/ ☜ **ـ گشایی**

**گشاد** / gošād/: *صفت.* ۱. شاش؛ واز؛ وەڵا؛ ئاوەڵا؛ ئاواڵە؛ فراوان؛ خڵ؛ هەراو؛ لێک بڵاو؛ کشن؛ نێوان کەوتوو ‹دندانهای گشاد: ددانی شاش› ۲. گەورە؛ فش و فۆڵ؛ فشڕەهۆڵ؛ زل؛ خڵ؛ فش؛ فلت؛ فراز؛ فرت؛ فرەهـ؛ فرەوان؛ بەرفرە؛ هەراو؛ ڤل؛ ڤال؛ زڕ؛ زڕت؛ فت؛ ئاوان؛ وڕاق؛ ڕەهندە؛ ئاوەڵا؛ ئاوەڵە؛ واڵ؛ والا؛ وشا ‹این پیراهن به تن من گشاد است: ئەم کراسە بۆ من گەورەیە› ۳. *[مجازی]* پان؛ پان و بەرین؛ فرەهـ؛ بەرفرە؛ فرەوان؛ بەرفرەوان؛ بەرگوشاد؛ فراز؛ فرت؛ فش؛ فلت؛ فرێ؛ ئاوان؛ بڵاو؛ ڤل؛ ڕەهندە؛ واڵ؛ ئاوەڵە ‹کوچەی گشاد: کۆلانی پان› ٤. *[مستهجن]* گێتەرەم؛ تەوزەل؛ فل؛ تەمەڵ.

▣ **گشاد دادن**: ۱. گوشا دان؛ تەک دان؛ مۆرەیەک بە تەنیا و لە شوێنی هەتەردا هێشتنەوە (لە کایەی تەختەنەرددا) ‹گشاد دادی حالا با یک یا دو آن را می‌زنم: گوشات دا ئێستا بە یەک یان دوو لێ ئەدەم› ۲. *[کنایی]* هەڵەکردن؛ بەتایبەت لە خەرج‌کردندا.

**گشاد شدن**: گەورەوە بوون؛ ڕەویانەوە؛ فش/ هەراو/ ڕەهۆڵ بوونەوە ‹پیراهنم را شستم گشاد شد: کراسەکەم شۆرد گەورە بووەوە›.

**گشاد کردن**: زل/ هەراو/ گوشاد/ فرەوان/ فرت‌کردنەوە؛ ڕەواندنەوە ‹سوراخ را کمی گشاد کرد: کونەکەی تۆزێک زل کردەوە›.

**گشادبازی** / gošādbāzî ، ـها/: *اسم. [کنایی]* گێتەرەمبازی؛ کار یان باری نەگونجاو و لە گۆترە، بەتایبەت لە خەرج‌کردندا. هەروەها: **گشادباز**

**گشادگی** / gošādegî ، ـها/: *اسم.* کراوەیی؛ بازی: ۱. ئاوەڵایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی باز بوون ۲. مەودا؛ نێوان ۳. دەم؛ گۆشە ‹گشادگی پرگار: دەمی پەرگال› ٤. *[مجازی]* ڕووخۆشی؛ ڕووگەشی؛ ناوچاو ڕۆشنی.

**گشادن** / gošādan/ ☜ **گشودن**

**گشاده** / gošāde/: *صفت. [ادبی]* کراوە؛ ئاوەڵا؛ ئاواڵە؛ باز؛ واز؛ گوشاد؛ بەتاق؛ هەراو؛ فرە ‹روی گشاده: ڕووی کراوە›.

**گشاده‌دل** / gošādedel/: *صفت. [مجازی]* دلاوا؛ دلاوا؛ دڵ‌ڤەکری؛ دلڤال؛ دلفرەوان.

**گشاده‌رو(ی)** / gošāderû(y)/: *صفت. [مجازی]* ڕووخۆش؛ ڕووگەش؛ ڕووکراوە؛ ناوچاو ڕۆشن؛ ڕوولکەن؛ دەم بە پێکەنین.

**گشادی** / gošādî ، ـها/: *اسم.* هەراوی؛ هەرایی؛ پانایی؛ بەرینایی؛ هیرایی؛ فرەوانی؛ گوشادی؛ فرتی؛ فراوانی؛ فشی؛ چۆنیەتی کراوە و باز بوون ‹گشادی کفش: هەراوی کەوش›.

**گشایش** / gošāyeš/: *اسم.* ۱. کار و ڕەوتی باز کردن؛ کردنەوە؛ ئەوەکەردەی ‹گشایش بازار: کردنەوەی بازار› ۲. /ـها/ فەرحانی؛ فردقی؛ بار و دۆخی باش و لەبار لە دوای ڕەوتێکی سەخت و

دژوار ‹امیدوارم این کار موجب گشایش در کارت بشود: هیوادارم ئەم کارە ببێتە هۆی فەرحانی لە کارەکەتدا›.

**ـگشایی** / gošāyî/: *پیواژە.* ـ وەکری؛ ـکەرەوەیی؛ کار و ڕەوتی کردنەوە؛ ئەوەکەردەی ‹گرە گشایی: گرێ کردنەوە›: **ـ گشائی**

**گشت** / gašt ، ـها/:*اسم.* گەشت: ۱. سەیران؛ کار و ڕەوتی گێلان؛ گەڕان؛ گەڕیان؛ گێلای ‹گشت و گذار: گەشت و گێل› ۲. کاری گەڕان بە ڕێگایەکدا بۆ چاوەدێری و پاسەوانی‌کردن ‹گشت شبانە: گەشتی شەوانە› ۳. ئەوەی بەم کارە ڕادەگا ‹گشت خیابان: گەشتی شەقام›.

▣ **گشت زدن**: گەشت لێدان؛ گەڕان؛ سووڕانەوە: ۱. پیاسەکردن؛ خول خواردن؛ دەوردانەوە ‹مدتی در باغ گشت زدیم: ماوەیەک بە نێو باخدا گەڕاین› ۲. گەڕان بە مەبەستی پاسەوانی‌کردن ‹دو نگهبان در حیاط گشت می‌زدند: دوو پاسەوان لە حەوشەدا گەشتیان لێ‌دەدا›.

**گشتار** / gaštār/:*اسم.* ۱. گۆڕانکاری؛ ئاڵ‌وگۆڕی ۲. کار و ڕەوتی گۆڕینەوە؛ گۆڕاندنەوە؛ گەهۆڕین؛ وارایەوە.

**گشتکره** / gaštkore/: [فارسی/ عربی]*اسم.* *[زمین‌شناسی]* تروپوسفیر؛ بەشی خوارووی کەش کە زۆربەی دیاردەکانی زەوی (وەک گۆڕانی تەوژم، هەور، با و باران و ...) تێدا ڕوو دەدا.

**گشتن** / gaštan/: *مصدر. لازم. متعدی.* //**گشتی**: گەڕای؛ **می‌گردی**: دەگەڕی؛ **بگرد**: بگەڕە// گەڕان؛ گەڕیان؛ گەردان؛ گێلەی؛ گێلای: ◻*لازم.* ۱. پیاسەکردن؛ سووڕانەوە؛ خولانەوە ‹گشتن در باغ: گەڕان لە نێو باخدا› ۲. سووڕانەوە؛ خولانەوە؛ خولیایوە؛ خول خواردن ‹گشتن چرخ: سووڕانەوەی چەرخ› ۳. بەڕێوە چوون؛ هەڵسووڕان ‹با این درآمد زندگیشان نمی‌گردد: بەم داهاتە ژیانیان بەڕێوە ناچێ› ◻*متعدی.* ٤. پشکنین؛ کروکاش‌کردن؛ وشکنەی ‹خانە را گشتن: ماڵ پشکنین› ۵. *[ادبی]* (وەکوو کاری هاوکرد بە مانای) بوون ‹تباە گشتن: خراپ بوون›❋ **گردیدن**. هەروەها: **گشتنی**

■ صفت فاعلی: **گردندە** (ـ)/ صفت مفعولی: **گشتە** (گەڕاو)/ مصدر منفی: **نگشتن** (نەگەڕان)

**گشت‌وگذار** / gašt-o-gozār ، ـها/:*اسم.* سەیران؛ گەشت؛ گەشت و گێل؛ گەرد؛ گەڕ؛ گێل ‹برای گشت و گذار رفته بودیم: چووبووین بۆ سەیران›.

**گشتی** / gaštî ، ـها/:*اسم.* ۱. پاسەوانی چەکداری گەڕۆک بۆ پاراستن و چاودێری ناوچەیەک ۲. ڕینجیر؛ چەکداری بارهاتوو بۆ هێرش‌هێنان و شەڕی تاکە کەسی.

**گشن** / gošn/: *صفت. [زیست‌شناسی]* ۱. توخمی؛ فەحل؛ فاڵ؛ کەڵ؛ لێهاتوو بۆ ئاوس‌کردن ۲. بە فاڵ؛ وە فاڵ؛ بە کەڵ؛ وە کەڵ؛ بە با؛ چوارپەلی مێوینەی نێرخواز (وەک ماین و مانگا).

**گشنگیری** / gošngîrî/:*اسم.* خەرز؛ گۆن؛ گۆهن؛ گوهنێل؛ گووهنێر؛ گوهنەئێل؛ گوهنێلی؛ کار و ڕەوتی داکەتن؛ فاڵ گرتن؛ کەڵ گرتن؛ کەڵ هاتن؛ جووت بوونی چوارپێ (لە ڕەشەوڵاخ و وردەپا و کێوی).

**گشنیدە** / gošnîde/: *صفت.* کەلگرتوو (بۆ مانگا)؛ فالگرتوو (بۆ ماین و ماکەر)؛ تکەگرتوو (بۆ بزن)؛ بەرانگرتوو (بۆ پەز)؛ چوارپێی ئاوس‌بوو/ کراو.

**گشنیز** / gešnîz ، ـها/:*اسم.* ۱. تاولە؛ تاولە؛ تاولێ؛ گشنیز؛ گژنیژ؛ گژنێژ؛ گژنیژە؛ گژنژە؛ بەنارۆمی؛ سەبزییەکی خۆراکییە، بە گوڵی چەتراسای پەمەیی یان سپیەوە، کە دژی سەرئێشە و کۆڵنج و گرسانی خوێنە ۲. ☜ **خاج ـ۲**

**گشودگی** / gušûdegî, gošûdegî ، ـها/:*اسم.* ئاوەڵایی؛ کراوەیی: ۱. چۆناوچۆنی ئاوەڵا بوون؛ کرانەوە ۲. دەرز؛ درز؛ کەلێن؛ کەل؛ شەق؛ چاک؛ ئاوەڵاییێک کە بە بۆنەی دەم بازکردنی شتێکەوە پەیدا دەبێ ‹گشودگی در: دەرزی

دەرگا›.

**گشودن** / gušûdan, gošûdan/: *مصدر. متعدی.* *[ادبی]* //**گشودی**: کردتەوە؛ **می‌گشایی**: دەکەیەوە؛ **بگشا**: بکەرەوە// ۱. کردنەوە؛ ئەوەکەردەی؛ کەردەیوە؛ بازکردن؛ وازکەردەی؛ ئاوەڵە/ ئاواڵە کردن؛ وەلا کەردەیوە؛ ڕاهی/ ڕایی کردن؛ ڤەکرن؛ ئاوەلا کردن ‹گشودن در: کردنەوەی دەرگا› ۲. *[مجازی]* هەڵێنان؛ هەڵاوردن؛ هەڵهێنان؛ هەلانین ‹گشودن معما: هەڵێنانی مەتەڵ› * **گشادن**. هەروەها: **گشودنی**

■ صفت فاعلی: **گشاینده** (ـــ)/ صفت مفعولی: **گشوده** (کراوە)/ مصدر منفی: **نگشودن** (نەکردنەوە)

**گشوده** / gušûde, gošûde/: *صفت. [ادبی]* کراوە؛ ئاوەلا؛ ڤالا؛ ئاواڵە؛ ئاوەڵە؛ وەلا؛ واز؛ باز؛ ڤال؛ ڤەکری؛ ڤالابووی؛ وەکری؛ دانەخراو ‹درِ گشوده: دەرکەی کراوە›.

**گفتار** / goftār ، ـها/: *اسم.* وتار؛ گوتار: ۱. کار و ڕەوتی ئاخاوتن؛ ئاخۆتن؛ ئاخەفتن؛ ئاخفتن؛ ئاخوفتن؛ ئیشن؛ ئووشن؛ دوان؛ دوەی؛ دوای؛ قسەکردن؛ دەمکردنەوە ‹اول اندیشه وانگهی گفتار: یەکەم بیرکەوە ئەنجا باخێوە› ۲. ویژە؛ **گوتە**؛ وتە؛ بێژە؛ ئەدوا؛ گۆ؛ گفت‌وگۆ؛ پەیڤ؛ قسە؛ گۆتی؛ قسیە؛ باس ‹گفتار رادیویی: وتاری ڕادیۆیی› ۳. نووسراوەیەک زۆرتر لە ۲۰۰ و کەمتر لە ۵۰۰۰ وشە ‹گفتاری دربارەی رباعیّات خیّام: گوتارێک لەمەڕ چوارینەکانی خەییامەوە›.

**گفتاردرمانی** / goftārdarmānî/: *اسم.* وتاردەرمانی: ۱. کار و ڕەوتی چارەسەرکردنی نەخۆشی دەروونی بە وت‌وویژی نێوان بژیشک و نەخۆش ۲. زانستی تایبەت بە دەرمانی گرفت لە قسەکردندا (وەک زمان گرتن؛ تور بوون و ...).

**گفتاری** / goftārî/: *صفت.* وتاری: ۱. سەر بە وتار ‹ارتباط گفتاری: پەیوەندی وتاری› ۲. ئاخافتنی؛ زارەکی؛ بە بار و دۆخی قسەوە ‹واژەی گفتاری: وشەی وتاری›.

**گفتگو** / goftogû, goftegû ، ـها/: *اسم.* وت‌وویژ؛ دەڤچەنگ؛ گفت‌وگۆ: ۱. دەمەتەقێ؛ دەمەتەقە؛ گەپ و گوڕ؛ کاری قسەکردن لەگەڵ کەسێکدا ‹گفتگوی تلفنی: وت‌وویژی تەلەفوونی› ۲. قسە و باس ‹در مورد کار گفت‌وگو کردیم: سەبارەت بە کار قسە و باسمان کرد› * **گفت‌وگو**

**گفتمان** / goft(e)mān ، ـها/: *اسم.* وت‌وویژ؛ مچلگە: ۱. قسە و باسی ڕەسمی، ڕێک‌وپێک و تێر و تەسەل لەمەڕ بابەتێکی دیاریکراوەوە ۲. ڕاوێژ؛ تەگبیر و ڕا.

**گفتن** / goftan/: *مصدر. لازم. متعدی.* //**گفتی**: وتت؛ **می‌گویی**: ئێژی؛ **بگو**: بێژە// وتن؛ کوتن؛ گوتن؛ گۆتن؛ وەتن؛ واتن؛ واتەی؛ گوهتن □*لازم.* ۱. *[گفتاری]* گومان‌کردن؛ وا بۆچوون؛ وا زانین؛ ئەجیای (بۆ یەکەم کەس ــ بێژەر ــ بەکار دێت) ‹گفتم حالا می‌آیی، ولی از تو خبری نشد: گوتم ئێستا دێی، بەلام هەوالێکت نەبوو› □*متعدی.* ۲. ئاخافتن؛ بێژان؛ بێژتن؛ ڤتن؛ ئاخۆتن؛ ئاخاوتن؛ ئاخەفتن؛ ئاخفتن؛ ئاخڤین؛ پەیڤین؛ ونستن؛ ئیشن؛ ئوشن؛ وێژان؛ وێژانن؛ وێژین؛ قسەکردن؛ دەنگ و وشەی زمانێک بە ئەندامی وێژایی ڕێکخستن و دەربڕین ۳. خەبەر دان؛ هەوال دان؛ ڕاگەیاندن؛ ئاگادارکردن ‹در نامەاش گفته بود به زودی برمی‌گردد: لە نامەکەیدا گوتبووی بەم زوانە دێتەوە› ٤. دەستوور/ فەرمان دان ‹گفتم بیایند تلویزیون را درست کنند: گوتم بێن تەلەڤیزیۆنەکە چاک بکەنەوە› ٥. هۆنینەوە ‹شعر گفتن: شێعر گوتن› ٦. ناو نان؛ ناو لێنان ‹به این می‌گویند رادیو: بەمە دەڵێن ڕادیۆ›.

■ صفت فاعلی: **گوینده** (وێژەر)/ صفت مفعولی: **گفته** (وێژراو)/ مصدر منفی: **نگفتن** (نەوتن)

**گفتنی** / goftanî ، ـها/: *اسم.* قسەی بۆ وتن؛ گوتەنی؛ شیاوی گوتن ‹گفتنی زیاد دارم اما نمی‌دانم از کجا شروع کنم: قسەی بۆ وتنم زۆرە بەلام نازانم لە کوێوە دەست پێ‌بکەم›.

**گفت و شنود** / goft-o-šenûd ، ـها/:اسم. وت‌وویژ؛ مجلگه؛ کار و ڕەوتی پێکەوە دوانی دوو یان چەند کەس؛ ئاخاوتن ‹چند شب در این باره گفت و شنود کردند: چەند شەو لەم بارەوە وت‌وویژیان کرد›.

**گفت‌وگو** / goft-o-gû/ ☜ **گفتگو**

**گفته** / gofte ، ـها/:اسم. قسە؛ وتە؛ گوتە؛ واتە؛ بێژە ‹این گفته‌ی اوست: ئەمە قسەی ئەوە›.

**گل** / gal/: حرف. ۱. دەور؛ دەورادەور؛ گرد؛ دەورمادەور؛ هۆرە؛ دەوروبەر یان بەشی سەرووی شتێک ‹گل هم جمع شدن: لە دەوری یەک کۆ بوونەوە› ۲. پیتی زێدە ‹گل و گُنده: زل و ول›.

▣ **گل هم انداختن**: هەڵچنین؛ داچنین؛ کەڵەکە پێ‌کردن؛ خستنە سەر/ پەنای یەکتر؛ لای/ لە بان یەکەو دانیان.

**گل هم کردن**: ۱. کۆکردنەوە؛ گلێرەوکردن؛ ماشتنەوە؛ ئەوەماشەی ۲. شەغلەمەکاری/ گۆترەکاری‌کردن؛ بە شپرزی کارکردن.

**گل** / gel/:اسم. قوڕ؛ هەرگ؛ هەرک؛ حەرگ؛ خەرگ؛ هەڕی؛ هەڕە؛ هەڕ؛ هوڕی؛ هوڕ؛ هەڕە؛ حەڕی؛ خەڕە؛ گیل؛ بشکوول؛ بشکوول؛ پشکوول؛ قیش؛ تەتن؛ گوڕ؛ موولە؛ تێکەڵاوی خۆڵ و ئاو.

▣ **گل اُخرا** ☜ **اُخرا**

**گل ارمنی**: گڵە ئەرمەنی؛ جۆرە گڵێکی سووری ڕۆشنە بۆ ڕەنگ بە کار دێ، جاران وەکوو دەرمانیش بەکار دەچوو.

**گل حرامزاده**: *[بنایی]* شفتە؛ تێکەڵاوی خاکەسوورە و قسڵ لە ئاودا.

**گل سرشور** ☜ رس چربی‌زدا، **رس**

**گل سفید**: گڵی سپی؛ جۆرە گڵێکی سپی و وردە وەک سپیاو، لە ئەندامی منداڵی ساوای دەدەن نەسووتێتەوە: **گل گیوه**

**گل کبود**: گڵەشین؛ لمتی بنی دەریا.

**گل گیوه** ☜ **گل سفید**

▣ **گل گرفتن**: ۱. قوڕ/ هەرگ‌گرتنەوە؛ حەری چێ کرن؛ هەڕەوەگێرتەی ‹یک استانبولی گل بگیر اینجا را پر کنیم: ئەستەمبوولیەک قوڕ بگرەوە ئێرەی پێ پڕ بکەینەوە› ۲. لە قوڕگرتن؛ گرتنە قوڕ؛ سواخ دان بە قوڕ؛ هەڕ دا پوەی ‹در اینجا را باید گل گرفت: دەرکی ئێرە دەبێ لە قوڕ گیرێ›.

**گل** / gol ، ـها/:اسم. گوڵ؛ گول: ۱. چیچک؛ چیچەک؛ گولیک؛ گولووک؛ گلووک؛ کولیلک؛ گلووک؛ گولەک؛ نەترک؛ ئەندامی زاوزێی گیای گوڵدار ‹گل انار: گوڵی هەنار› ۲. کولیلک؛ پنچکەی گیای جوان کە بۆ جوانی ڕایدەگرن ‹گل اطلسی: گولە حەریرە› ۳. نەخش و نیگاری گوڵ ‹پارچەب گلدار: پارچەی گوڵدار› ٤. ئەوەی لە گوڵ دەچێ ‹گل سینە: گوڵی بەر سینگ› ٥. سەرتۆپ؛ سەرگوڵ؛ چاکترین پاژ؛ سەرتەڵ؛ هەڵبژاردە ‹گل هندوانە: گوڵی شووتی› ٦. مۆرەی نێو کایەی پڕ یان پووچ ۷. گڕی ئاگر ۸. [انگلیسی] ئامانج (لەو یاریانەی کە تۆپ دەچێتە ناو دەروازە یان شتێکەوە).

▣ **گل آب** ☜ نیلوفر آبی، **نیلوفر**

**گل آتشی**: گولە ئەرخەوانی؛ گولە ئاگری؛ بنەگیایەکی ئالفی بە گەڵای نەرم و گوڵی گەورەی سوورتۆخەوە.

**گل آفتابگردان**: گولەبەڕۆژە؛ ڕۆجیارپرێس؛ ڕۆزامپەرێز؛ ڕۆجیارپەرست؛ ڕۆچیارپەرەس؛ ڕۆژگارپەرست؛ ڕۆژیارپەرست؛ پاڵەوی؛ لاسکێکی بەرزی گەڵاپانی گولە زەردە، تا تۆم نەکا و وشک هەڵنەگەڕێ دەگەڵ خۆر دەگەڕێ.

**گل آویز**: دارچکێکی جوانە بە گوڵی سووری شۆڕەوە.

**گل ابریشم** ☜ **شب‌خُسب**

**گل استکانی**: گولەزەنگ؛ ڕۆنیاسە گیا؛

گوڵەپیاڵە؛ بنەگیایەکی پایایە بە گوڵی جوان و هەمەڕەنگەوە، هاوینان دەپشکوێ: **اِستکانی**

**گل اشرفی:** گوڵی ئەشرەفی؛ بنەگیایەکی ئاڵفی لق هەڵکشاوە بە گەڵای پڕ و پەڕەگوڵی پان و زەردەوە.

**گل اطلسی:** گوڵبۆری؛ گوڵی شەیپووری؛ گوڵە حەریرە؛ ئەتڵەسی؛ گوڵێکی جوانی شەیپووریە بە ڕەنگی سپی، پەمەیی و بنەوشەوە، شەوان بۆن و بەرامەیەکی خۆش بەر دەداتەوە.

**گل انار:** هنارین؛ سوورەک؛ گلیار؛ شکۆفەی دار هەنار؛ گوڵ هەنار.

**گل بامداد:** لەولاو؛ لەولاوە؛ لەڤلاڤە؛ **لاڤلاڤ؛** گوڵی لاولاو کە بەیانان دەپشکوێ.

**گل بستان‌افروز** ☜ **گل تاج خروس**

**گل بوقی:** گوڵی جوان و سووری شەیپووری تایبەتی ناوچەی چین و ژاپون.

**گل پیوندی** ☜ **گل صدبرگ**

**گل تاج‌خروس:** بادرو؛ گوڵی‌پۆ؛ پۆپە کەڵەشێرە؛ گوڵ مەخموور؛ گوڵێکی سووری چەند پەلکە، پەلکەکانی لە پۆپەی کەڵەباب دەکا.

**گل تخم‌مرغ:** گوڵە باینجان؛ گوڵی گیای باینجان.

**گل جعفری:** شەسپەڕە؛ گوڵەشەسپەلە؛ بتە گیایەکی جوانی پڕ گەڵایە، بە بۆنێکی ناخۆشەوە.

**گل جیبی** ☜ **گل کیسه‌ای**

**گل چای:** گوڵی چای؛ جۆرێک گوڵەباخی پڕ پەڕی نارنجی ڕەنگە.

**گل چینی:** پەیکەرێکی ڕازێنەیی بە شێوەی گوڵ و بووکەڵە و گیانەوەر، لە هەویری گەنمەشامی، چەسپی چێو و گلیسرین دروست دەبێ و پاش دروستکردن ڕەنگ دەکرێ.

**گل حسرت** ☜ **سورنجان**

**گل حنا:** گوڵە خەنە؛ خەنی؛ خەنیە؛ گوڵێکی سوور یان پەمەییە بە لقی سووری تورتەوە، دوای وشک هەڵاتن دانەکانی دەپژێ.

**گل دنبه** ☜ **بداغ**

**گل رنگ:** ١. قافلی؛ قاخلی؛ کاخلی؛ کاژێڵە؛ کاژێرە؛ شمڵی؛ گوڵەزەردە؛ گیایەکی لاسکسپی دەس‌چێنە، بە گەڵای هێلکەیی ساف و لقی ڕاستەوە کە گوڵێکی نارنجی، زەرد یان سوور دەکا: **کاجیره؛ کافشه** ٢. ماکێکی ڕەنگی کە لە تۆمی ئەو گیایە بەرهەم دێ.

**گل زرد:** گوڵە زەردە؛ گوڵە زەرد؛ گوڵە وڵ؛ وڵە زەرد؛ دارچکێکی لق و پۆ کەوانی دڕکاویە، گوڵێکی زەردی بۆنخۆش دەکا، مرەبا و هەڵوای لێ‌دروست دەکەن.

**گل ساعتی:** گوڵی ساعەتی؛ گوڵە شەراوی؛ شیرین‌توو؛ بنەگیایەکی پێچی گەڵا پان و بڵاوە بە گوڵی درشت و پانکەڵەی سوور یان ئەرخەوانی بریقەدارەوە: **ساعتی**

**گل ستاره‌ای:** گوڵەستێرە؛ گۆسارە؛ گوڵەئاسۆ؛ گیای ڕازێنەیی بە گوڵی زل و زەردی وەک خۆرەوە.

**گل سر:** گوڵەسەر؛ گوڵی سەر؛ خشڵی گوڵ‌ئاسا بۆ ڕازاندنەوەی قژ.

**گل سرخ:** گوڵخونچە؛ گوڵەخونچە: ١. سوورگوڵ؛ ماوەرد؛ باتینۆک؛ گیایەکی ڕازێنەرە بە لاسکی دڕکن، گوڵی بۆنخۆشی سپی، زەرد یا سوورەوە ٢. جۆری سوورتۆخی ئەو گوڵە * **رُز**

**گل سرخ عطری** ☜ **گل محمدی**

**گل سرنگون:** شلێرە؛ هەڵاڵەبرمە؛ هەڵاڵە برم‌برم؛ شلێر؛ شلیل؛ گوڵی شلێرە؛ گوڵا پێغەمبەر؛ گوڵێکی سووری ئاڵ یان زەردی پیاڵەئاسای سەرەونخوونە.

گل سینه: گوڵ سینه؛ خشڵی سەر سینگ.
گل شاهین ☜ زاغک
گل شراب: دەوەنێ کە گوڵەکەی بۆنی شەراو دەدا.
گل صدبرگ: گوڵی پێوەنی؛ گوڵە تۆپڵاخە؛ ولە تۆپڵاخە؛ جۆرێ گوڵی سووری پڕ گەڵا و جوان: **گل پیوندی**
گل فراموشم‌مکن: خەڵاتە گیا؛ گوڵە ئەوین؛ جۆرێ گوڵی سپی یان ئاوی کاڵە کە وەک هێشوو بەڵام لە ڕزنێکدا دەپشکوێ.
گل قاصد ☜ **قاصدک**
گل کاغذی: گوڵە کاغەزی؛ دارچکێکی جوانی گەرمەسێرە بە لقی داهاتوو، گەڵای کەسک و گوڵی پچووکی سێ‌پەڕی سپی، ئەرخەوانی، سوور یان نارنجیەوە.
گل کتانی: گوڵە کەتان؛ هەمیشە گوڵ؛ هەمیشە جوان؛ هەمیشە بەهار؛ جوانە گوڵ؛ ناوی چەن جۆر گوڵە مەیموون بە لقی نەرم و داشۆڕاو و گوڵی بنەوشەوە: **کتانی**
گل کوکب: کەوکەو؛ گولا شێست‌پەڕ؛ گوڵە ئەستەمبولی؛ گوڵێکی پڕ پەلکە بە زۆر ڕەنگان.
گل کیسه‌ای: گیایەکی گەڵاپانی برگە- برگەیە بە گوڵی سوور، زەرد و برێ‌جار خاڵ- خاڵەوە کە وەک کیف یان کیسەی فوودراوە: **گل کیفی؛ گل جیبی**
گل کیفی ☜ **گل‌کیسه‌ای**
گل گلاب ☜ **گل محمدی**
گل ماهور ☜ **خرگوشک**
گل محمدی: گوڵ؛ گوڵ‌گولاو؛ گوڵی گولاو؛ گوڵەباخ؛ گوڵەباغ؛ گوڵباخی؛ سوورگوڵ؛ سۆرگوڵ؛ گولاسۆر؛ ولی؛ ولە مەخمەلیە؛ ولە گولاو؛ ئەو گوڵە لاسک بە دڕکەی کە گولاوی لێ‌دەگیرێ: **گل‌سرخ‌عطری؛ گل‌گلاب**
گل مصنوعی: گوڵی دەستکرد؛ گوڵێ کە لە پەڕ، پەڕۆ و کاغەزی ڕەنگی دروست دەکرێت.
گل مولا: گوڵ‌مەولا؛ ڕێزناوێ بۆ بانگ‌کردنی دەروێشان.
گل میخک: گوڵەمێخەک؛ گوڵی مێخەک؛ گوڵێکی بۆنخۆشە و زۆر ڕەنگی هەیە.
گل میمون: زارەگا؛ گیا بالووکە؛ گوڵە ئاوات؛ گوڵە ئاخ؛ گوڵە شفا؛ مەخەلەسە؛ گیایێکی ڕازێنەری بە گوڵی سوور، ئاڵ یان سپیەوە: **میمونی**
گل ناز: نازناز؛ نازنازی؛ گوڵناز؛ شەرمینۆک؛ گوڵێکی زۆر جوانە لە بەر خۆر دەپشکوێ و چەند ڕەنگی هەیە و ئەگەر دەستی لێ‌کەوێ پەڕەکانی لوول دەبن.
گل نوروز: نەورۆزە؛ گوڵە نەورۆزە؛ گوڵە نەورۆزی؛ کولبزک؛ گیایەکی گەڵا نەرم و ئەستوورە کە هێشووە گوڵی بە سەرەتای بەهاردا لە سەر لاسکەوە دەردێ.
▣ **گل از گل کسی شکفتن:** *[مجازی]* شاگەشکە بوون؛ زۆر خۆشحاڵ بوون ‹**با دیدن پول‌ها** گل از گلش شکفت: **هەر پارەکەی بینی** شاگەشکە بوو›.
**گل انداختن:** ۱. داگرسان؛ سوور بوونەوە ‹**صورتش** گل انداخته بود: **ڕوخساری** داگرسابوو› ۲. گوڵ/ نەخش تێخستن ‹**چهارگوشەی دستمال را هم** گل انداخته بود: **چوار سووچی دەسرەکەشی** گوڵ تێخستبوو›.
**گل دادن:** گوڵ‌کردن؛ گوڵ‌کردنەوە؛ گوڵ‌دان ‹**امروز صبح یاس** گل داد: **ئەم بەیانیە یاسەکە** گوڵی دا›.
**گل زدن:** *[ورزش]* گوڵ‌کردن؛ گوڵ لێدان؛ تۆپ خستنە ناو دەروازە، سەبەتە یان زەوینی بەرامبەرەوە ‹**تیم ما دو** گل زد: **تیمی ئێمە دوو** گوڵی کرد›.
**گل شدن:** *[ورزش]* بوونە گوڵ؛ گوڵ بوون؛ تۆپ کەوتنە ناو دەروازە، سەبەت یان زەوینەوە ‹گل شده بود **ولی داور قبول نکرد:** ببووە گوڵ **بەڵام**

داوەر قەبووڵی نەکرد›.

**گل کاشتن:** ۱. گوڵ نان؛ لق یان شەتڵی گوڵ لە زەویدا کێڵان ۲. *[کنایی]* سکە لێدان؛ کاری بەجێ کردن ۳. *[ورزش]* گوڵ‌لێدان؛ گوڵ‌کردن.

**گل کردن:** ۱. گوڵ‌کردن/ کردنەوە؛ گوڵ‌دان؛ گوڵ پشکووتن ‹نسترن‌ها گل کردند: نەسترەنەکان گوڵیان کرد› ۲. *[مجازی]* دەرکەوتن؛ کەوتنە بەرچاو؛ وە بەرچاو هاتن ‹بزودی در کلاس گل کرد: خێرا لە پۆلەکەدا دەرکەوت› ۳. *[ورزش]* گوڵ‌لێدان؛ گوڵ‌کردن.

**گل کردن خرج:** *[نظامی]* نەتەقینەوەی تەقەمەنی پاش کارکردنی چاشنی.

**گل گفتن:** *[مجازی]* چاک‌گوتن/ وتن؛ خۆش/ خاس وتن؛ قسەی بەجێ و بە وەخت‌کردن ‹آفرین گل گفتی: ئافەرەم چاکت گوت›.

**گل گفتن و گل شنفن:** *[مجازی]* قسەی خۆش کردن؛ وت‌وویژی خۆش‌کردن ‹نشسته بودیم گل می‌گفتیم و گل می‌شنفتیم که یک دفعه صدایی بلند شد: دانیشتبووین قسەی خوشمان دەکرد، ناکاو دەنگێک بەرز بۆوە›.

**از گل نازکتر نگفتن:** *[مجازی]* لە گوڵ ناسکتر نەوتن؛ لە گوڵ کەمتر نەگوتن؛ قسەی ناخۆش نەکردن؛ خراپ بە زاردا نەهاتن ‹او تا به امروز به عروسش از گل نازکتر نگفته است: تا ئێستە لە گوڵ ناسکتری بە وەویەکەی نەوتگە›.

**گل‌آذین** / golāzîn ، ـها/: *اسم. [گیاه‌شناسی]* چۆناوچۆنی نیشتنە سەر لاسکی پەڕی گوڵ.

**گل‌آرایی** / golārāyî/: *اسم.* گوڵ‌ڕازێنی؛ هونەری چنین و ڕازاندنەوەی چەپکی گوڵ.

**گل‌آلود** / gelālûd/: *صفت.* قوڕاوی؛ زلقاوی؛ سلقاوی؛ هەڕگاوی؛ خەڕگین؛ ئاڤشیز؛ لیخن؛ لەغ؛ بە قوڕەوە تلاو ‹آب گل‌الود: ئاوی قوڕاوی›.

**گلاب** / golāb/: *اسم.* گولاو؛ گولاڤ؛ پنکاف؛ پنکاف؛ بەرکم؛ لیچ؛ ئاوێکی بۆنخۆشە لە هەڵمی ساردەوەبووی سەر گوڵباخی دەگرن.

**گلاب‌پاش** / golābpāš/ ☜ **گلابدان**

**گلابتون** / golābatûn/: *اسم.* گولاوەتوون؛ گولابەتوون؛ گولاباتون؛ گولاوباتون؛ گولاڤدون؛ گولاواتوون: ۱. زرهۆک؛ باریکە تالی زێڕین یان زیوین کە لەگەڵ ئاوریشم بۆ تان و پۆی پارچەی زەڕی بە کاری دەبەن ۲. زرهۆک؛ تەنراوەیەکی ئاوریشمی بە گولەنگەوە کراو، کە بە پرچیەوە هەڵدەواسن ۳. گولی زۆپی لە تان و پۆی زێڕ و زیو چنراو، کە بە سەر پارچەیدا دەدروون.

**گلابتونی** / golābatûnî/: *صفت.* گولاوەتوونی؛ وەکوو گولاباتون یان ڕازاوە بە گولابەتوون ‹زلف‌های گلابتونی: پرچی گولاوەتوونی›.

**گلابدان** / golābdān ، ـها/: گولاوپاش؛ گولاودان؛ دەفری گولاو؛ تۆنگی گچکەی دەسکدار و مل‌باریک بە لوولەیەکەوە بۆ گولاو پژاندن بە دەست و سەر و چاودا: **گلابپاش**

**گلابگیری** / golābgîrî/: *اسم.* گولاوگیری؛ گولاوگری؛ کار و ڕەوتی گولاوگرتن ‹گلابگیری هنوز شروع نشده بود: گولاوگیری هێشتا دەستی پێ نەکردبوو›.

**گلابی** / golābî ، ـها/: *اسم.* هەرمێ؛ هەمرۆ؛ ئەمرۆ؛ هەرمۆ؛ هرمێ؛ هرمی؛ هارمێ؛ هورمی؛ هەرمی؛ هرمیک؛ مرۆی؛ مروێ؛ مەروێ؛ خەریبۆک؛ مەروە؛ موریە؛ شکووک؛ گولاوی؛ گولاوەی: ۱. پنچک یان دارێ بە ڕیشووی داچوو، گەڵای ساکار، ساف و ددانەدار، گولی سپی مەیلەو ئاڵ و کۆوە ۲. بەری ئەو دارە کە مێوەیەکی بن‌خڕی درێژۆکەیە، زۆر جۆری هەیە و پاییزان دەگا ۳. ☜ **پیک**

▣ گلابی جنگلی: شتو؛ هەرمێ کێویلە؛ هەرمێ شینکە؛ هەمرۆ کووجیلە؛ کۆرسک؛ کۆرۆسک؛ کرۆسک؛ کروکس؛ شکۆلە؛ گیرسک؛ گرسک؛ گرۆسک؛ شکۆک؛ شەکۆک؛ شکۆکە؛ شەقۆق؛

داری هەرمێ کێویلە کە بەرەکەی چکۆلەترە.

**گلاسنوست** /g(e)lāsnost/: [؟]/اسم. گلاسنۆست؛ بزووتنەوەی گورباچوف، ئاخر سەرۆکی سۆڤیەت بە مەبەستی دەرخستنی کەم و کوورییەکانی نێو کۆمەلگا، ولات و دەزگای حکوومەتی و ڕاویژ بۆ چارەسەرکردنیان.

**گل افشان** / golafšān/: صفت. گولبارێن؛ گولپژێن.

**گل افشانی** / golafšānî، ـها/:اسم. گولباران؛ گولپژێنی؛ گولڕێژان؛ کار و ڕەوتی دابارانـدنی گولی زۆر بە سەر شوێن یان کەسێکدا.

**گل اندام** / golandām/: صفت. گولەندام؛ گولئەندام؛ خاوەن بالای جوان و ڕێک.

**گلاویز** / galāvîz, gelāvîz/: صفت. ئاوقا؛ ئاوقە؛ ئاوقەد؛ هاوقا؛ ئاوریش؛ تێکهالاو؛ تێک گیراو؛ هەلباسک؛ تێکهەلچوو؛ بچەنگانێ؛ چنگاوش؛ چنگاوەش؛ بەرەنگار؛ دەسەویەخە؛ دەگژڕاچوو ‹با هم گلاویز شدند: ئاوقای یەک بوون›.

◘ **گلاویز شدن**: پێکهەلپرژان؛ تێکهەلچرژان؛ تێکهەلچوون؛ ئاوقا بوون؛ تێکهالان؛ ئامباز بوون؛ بە گژدا یەکدا چوون؛ دەگژ یەک ڕاچوون؛ بە گژ یەکدا هاتن؛ بەگژ یەکا پەڕین؛ بەگژا هاتن؛ بە گژا چوون؛ ڤەگەڤزاندن؛ نیشتنە مل (یەک)؛ چنگاوەش بوون؛ دەسەویەخە بوون؛ تێکهەلچوون؛ تێکەوەگلان؛ ڕژانە یەک؛ پێکا چوون؛ تێکەوە گلان؛ بەلشین؛ بەرەنگار بوون؛ کەتن هەڤ؛ گەرساندن؛ تێکەلاو بوون و مل دەبەر ملی یەکتر نان ‹با هم گلاویز شدند و همدیگر را خونین و مالین کردند: پێکهەلپرژان و یەکتریان خوێناولی کرد›.

**گلایدر** / g(e)lāyder، ـها/: [انگلیسی]/اسم. گلایدیر؛ فرۆکەی بێموتور کە بە با دەفڕێ: **هواسُر**

**گلایول** / gelāyol، ـها/: [فرانسوی]/اسم. شالانگ؛ گول دیاری؛ گولە خەنجەری؛ گولە ئەسپەک؛ چەمقالاو؛ گەلایۆل؛ گولێکی جوانی هەمەڕەنگی گەلاپان و لق هەلکشاوە، لە سەر هەر لقێک ریزێک گولی شەیپووڕئاسا دەپشکوێن.

**گلایه** / gelāye/ ☜ **گله**

**گلباد** / golbād/:اسم. کیسەئاسایەکی کەلەقەندی کە وەک نوانەیێ لایەن و تەوژمی بای ناوچەیەک پیشان دەدا.

**گلباران** / golbārān/:اسم. گولباران؛ دۆخی وەرین یان هاویشتنی گول.

◘ **گلباران کردن**: گولباران کردن؛ گولی زۆر تێکرا داباراندن ‹مردم مرقدش را گلباران کردند: خەلکی گلکۆیان گولباران کرد›.

**گل باقالی**[1] / golbāqālî/: [فارسی/ از یونانی]/اسم. پەلە- پەلەی ڕەنگامە لە سەر تەختی شتێک.

**گل باقالی**[2]: [فارسی/ از یونانی] صفت. چیل- چیل؛ تایبەتمەندی ئەوەی پەلەی ڕەنگامەی لە سەر بێ ‹مُرغ گُلباقالی: مریشکی چیل- چیل›.

**گلبانگ** / golbāng، ـها/:اسم. چریکە؛ بەرزەچڕە؛ دەنگی خۆش و بەرز.

◙ **گلبانگ مسلمانی**: [کنایی] بانگ؛ بان؛ سەلا؛ بانگی نوێژ.

**گلبرگ** / golbarg، ـها/:اسم. گولپەڕ؛ گولپەڕە؛ گولپەل؛ بەلگ؛ گەلاگول؛ پەڕەی گول؛ پەڕە ڕەنگینەکانی دەوری گول.

**گلبن** / golbon، ـان/:اسم. [ادبی] بنچەگول؛ بنچەگول؛ بنەگول؛ بتەیەکی گول بە سەرەوە ڕواو.

**گلبند** / golband/:اسم. تاجەگولینە؛ ئالقەیێک گولی پێکەوە بەستراو کە وەک تاج لە سەری دەکەن.

**گلبول** / golubûl, g(u)lubûl، ـها/: [فرانسوی] ☜ **گویچە**

◙ **گلبول سرخ**: گویچەی سرخ ☜ **گویچە**

**گلبول قرمز**: گویچەی سفید ☜ **گویچە**

**گلبولین** / golubûlîn, g(u)lubûlîn/: [فرانسوی] *اسم. [شیمی]* گولوبوولین؛ ناوی گشتی بۆ تاقمێک پرۆتێیینی گیایی و گیانەوەری کە لە نێو پلاسمای خوێنی مرۆشدا هەیە و کاری بەرگری لە نەخۆشیە: **گلوبولین**

**گل بهی**[1] / gol-(e)-behî/: *اسم.* گولی؛ چێرەیی؛ ڕەنگی سوورکاڵی مەیلەو نارنجی.

**گل بهی**[2]: *صفت.* گولی؛ چێرەیی؛ بە ڕەنگی سوورکاڵی مەیلەو نارنجی.

**گلپر** / golpar، ـها/: *اسم.* گولپەڕ: ۱. سۆلان؛ سوولان؛ گولەسۆ؛ پلەسۆ؛ ئالفە گیایەکی ساقەتە وەک قامیش، بۆنخۆش، گەلاپان، گولسپی، میوە هێلکەیی و خۆش بەرامەیە ۲. میوەی ئەو گیایە کە وەک بەهارات بە کار دەڕوا.

**گلپوش** / golpûš، ـها/: *اسم.* گولپوش؛ بەشی دەرەکی گول کە پەرچەم و مێوینەکەی دادەپۆشێ: **فراپوش**

**گلچرخ** / golčarx، ـها/: *اسم.* مانمانەگێجێ؛ کاری خولانەوەی لە سەر یەک بە دەوری خۆدا (زیاتر لە نێو گۆڕکی زۆرخانە).

**گلچهره** / golčehre، ـگان/: *صفت. [مجازی]* ڕوومەتگول؛ گولدیمەن؛ گولڕوخسار؛ گولچار؛ گولڕوو؛ خاوەن ڕوخساری جوان و ناسک وەکوو گول: **گُلرخ؛ گُلرو**

**گلچین** / golčîn/: *اسم.* ۱. /ـان/ گولچن؛ گولچین؛ کەسێ کە گول دەچنێ ۲. گولبژێر؛ تەلبژێر؛ تەلبژێن؛ تالچین؛ سەرتەل؛ سەرتل؛ سەرگول؛ ئەوی لە ناو کۆمایەکدا هەلبژێردراوە.

▣ **گلچین ـ گلچین:** پسکەپسک؛ نەرمەنەرم؛ نەرمەـ نەرمە؛ ئارام ـ ئارام ؛ شێنەـ شێنەی؛ هێدی ـ هێدی؛ بە ئارامی؛ بە هێواشی؛ بە ئەسپایی (بەتایبەت بۆ ڕۆیشتن).

▣ **گلچین کردن:** تەلبژێر/ گولبژێرکردن؛ هۆرچنیەی؛ هەلبژاردن و جیا کردنەوەی باشترین شتانی کۆمەلەیێک ‹اینها را از میان سیصد تا گلچین کردەام: ئەمانەم لە نێو سێسەد دانەدا گولبژێر کردووە›.

**گل خاری**[1] / golxārî/: *اسم.* ئال؛ سوورکاڵ؛ گولخار؛ ڕەنگی سووری کاڵ.

**گل خاری**[2]: *صفت.* ئال؛ سوورکاڵ؛ گولخار؛ بە ڕەنگی سووری کاڵ.

**گلخانه** / golxāne، ـها/: *اسم.* گوڕنی؛ گولخانە؛ شوێنی پەروەردەکردنی گول و گیا بەتایبەت شوێنێکی سەرگیراو بە گەرما و ڕووناهی گونجاو و ڕاگیراوەوە.

**گلخانه ای** / golxāne'î/: *صفت.* گولخانەیی؛ لە گولخانەدا پەروەردەکراو ‹**گوجەفرنگی** گلخانەای: تەماتەی گولخانەیی›.

**گلخن** / golxan، ـها/: *اسم. [ادبی]* ۱. توون؛ توونخانە؛ هاتوون؛ ئاتوون؛ تین؛ تون؛ ئاگردانی گەرماو ۲. کوورە؛ کوورەپەزخانە.

**گلخن تاب** / golxantāb، ـها؛ ـان/: *اسم.* توونچی؛ پەینچی؛ توونەوان: *الف)* ئاگر هەلکەری گەرماو *ب)* ئاگرەوانی ئاگردانی کوورە.

**گلدار** / goldār/: *صفت.* گولدار: ۱. بە توانست و لێهاتوویی گولدان ۲. بە نەخش و نیگاری گولەوە ‹پارچەی گلدار: پارچەی گولدار›.

**گلدان** / goldān، ـها/: *اسم.* گولدان؛ گولدانک؛ ئینجانە؛ تەبەک: ۱. دەفرێکی دەم هەراو بۆ ناشتن و بەرهەم هێنانی گول ‹یک گلدان برای این گل بخر!: گولدانێک بۆ ئەم گولە بستێنە!› ۲. دەفری گول بە گولەکەی ناویەوە ‹گلدان یاس را بگذار جلو پنجرە: گولدانی یاسەکە لە بەر پەنجێرەکەوە دانە› ۳. دەفرێکی (زۆرتر بلۆر) بۆ هەلگرتنی لقی گول ‹گلدان را آب کن این شاخەهای گل را بگذار تویش: ئاو بکەرە گولدانەکەوە ئەم لقە گولانەی تێخە› ٤. دەفرێکی (زۆرتر کانزا) بۆ کۆکردنەوەی دەنگی ئەندامانی ئەنجومەنێک.

▣ **گلدان سفالی:** ئینجانە؛ سوێنە؛ کەلەکە؛ دەفری سوالەتی گول تێدا چاندن.

**گلدسته** / goldaste ، ـها/: اسم. ۱. *[ادبی]* دەستەگوڵ؛ چەپک؛ چەپکەگوڵ؛ تۆپەگوڵ؛ دەسکەگوڵ ۲. کەمەرە؛ جێگەی بانگدەر لە سەر مناره ‹گلدستەی مسجد: کەمەرەی مزگەوت›.

**گلدوزی** / goldûzî/: اسم. نتر؛ نتل: ۱. گوڵچنی؛ گوڵدۆزی؛ چنیک؛ کار و ڕەوتی نتراندن؛ نەورنایش؛ هونەر یان لێزانی گوڵدروون لە سەر پارچە ‹کلاس گلدوزی می‌رفتم: دەچوومە کەلاسی گوڵچنی› ۲. /ـها/ گوڵچن؛ گوڵچین؛ ئەو نەخشانە لە سەر قوماشی دەدروون ‹گلدوزی‌های قشنگی داشت: نترگەلێکی جوانی هەبوو›.

▣ **گلدوزی کردن**: نتراندن؛ نتلاندن؛ گوڵچنین؛ نەورنایش؛ نەخشاندنی پارچە بە دووران لە سەری.

**گلر** / goler ، ـها/: [از انگلیسی] اسم. *[ورزش]* گوڵێر؛ گوڵچێ؛ دەروازەبان (لە کایەگەلی دەروازەداردا).

**گلرخ** / golrox/ ☜ **گلچهره**

**گلرنگ** / golrang/: صفت. ئاڵ؛ گوڵخار؛ سوورکاڵ؛ بە ڕەنگی سووری ڕۆشن.

**گلرو** / golrû/ ☜ **گلچهره**

**گلریزان** / golrîzān/: اسم. ۱. گوڵڕێژان؛ ڕەوتی وەرینی گوڵپەڕەکانی دار و دەوەن ‹درختان گلریزان کرده بودند و زمین از گل پوشیده شده بود: دارەکان گوڵڕێژانیان کردبوو، زەوی لە گوڵ داپۆشرابوو› ۲. گوڵپژێن؛ کاری ڕژاندن یان پاشینی گوڵی زۆر لە شوێنێ ‹بر سر عروس گلریزان کردند: بە سەر بووکدا گوڵپژێنیان کرد› ۳. *[کنایی]* باربوو؛ شێوەیەک کۆکردنەوەی یارمەتی (بەتایبەت لە زۆرخانەدا بۆ پاڵەوانێکی هەژار).

**گلزا** / golzā/: صفت. *[گیاه‌شناسی]* گوڵدەر؛ بە تایبەتمەندی دەردانی گوڵ.

**گلزار** / golzār ، ـها/: اسم. گوڵزار؛ گوڵسان؛ گوڵەک؛ گوڵجاڕ؛ گوڵزار؛ شوێنێ کە گوڵی زۆری لێ ڕواوە.

**گلزن** / golzan ، ـها؛ ـان/: [انگلیسی/ فارسی] اسم. *[ورزش]* گوڵکەر؛ لێهاتووی گوڵ کردن لە یاری تۆپاندا.

**گلسازی** / golsāzî/: اسم. گوڵسازی؛ هونەری دروست کردنی گوڵ لە پارچە، پلاستیک، کاغەز یان هەر شتێکی‌تر. هەروەها: **گلسازی**

**گلستان** / golestān ، ـها/: اسم. گوڵستان؛ گوڵیستان؛ باغچەی گوڵان؛ باخێ کە گوڵی جۆراوجۆری تێدا پەروەردە دەکرێ.

**گلسنگ** / gol(e)sang/: اسم. کرێژ؛ کرێژ؛ کرێش؛ کرێژەبەرد؛ کرێژەبەرد؛ قرێژەبەرد؛ قۆزەبەرد؛ گلەوەز؛ مەخمەلێنە؛ بقز؛ خەنەتیفک؛ گیایەکی بۆری شینباو یان قاوەیی و سوورە کە وێڕای جلشین و قەوزە لە سەر بەرد و دار و دەوەن دەڕوێ.

**گلسنگی** / gol(e)sangî/: صفت. بقزەیی؛ بە ڕەنگی کرێژە بەرد.

**گلشن** / golšan ، ـها/: اسم. گوڵستان؛ گوڵشەن؛ گوڵشێن؛ باخی گوڵ.

**گلعذار** / gol'ozār, gol'ezār/: [فارسی/ عربی] صفت. *[ادبی]* گوڵڕوو؛ گوڵڕوخسار؛ ڕوومەت‌گوڵ؛ گوڵدیمەن؛ گوڵچار؛ شێوەگوڵ؛ خاوەن ڕوومەتی وەک پەڕەی گوڵ.

**گلف** / golf/: [انگلیسی] اسم. گوڵف؛ گەمەیەکی وڵاتانی ئینگلیزی‌زمان، لە زەویەک بە ۹ یا ۱۸ کونەوە، کە یاریزان بە گۆچانێکەوە لە تۆپێکی گچکەی سپی هەڵئەدا بۆ ناو کونەکان، لە ئاکامدا ئەو کەسە دەیباتەوە کە بە لێدانی کەمتر تۆپەکە بخاتە ناو کونەکانەوە.

**گلفام** / golfām/: صفت. گوڵباو؛ گوڵباڤ؛ گوڵ‌گزی؛ سووری ئاڵ؛ ئاڵ و واڵ؛ بە ڕەنگی وەکوو گوڵەسوورە.

**گل‌فروشی** / golfurûšî/: اسم. گوڵ‌فرۆشی؛ گوڵ‌ورەشی: ۱. کاری گوڵ فرۆشتن ۲. /ـها/ دووکانی گوڵ‌فرۆشی. هەروەها: **گلفروش**

**گلفشان** / gelfešān ، ـها/:اسم. *[زمین‌شناسی]* گلپژێن؛ چالێکی قووچەکی بە چەن زارکی بچووکەوە، کە قوڕ و گازی لێوە هەڵدەپژێ.

**گلفهشنگ** / golfahšang ، ـها/:اسم. چلووره؛ زەمبەلیلک؛ زەمەگلێره؛ ژەکلێره؛ کلیله؛ گلیلە؛ سوولەڕمە؛ ڕمە؛ بەیسێ؛ قەندیل: ۱. شووشە سەهۆڵ؛ شوشەسۆل؛ سەهۆڵێ کە بە شاخ و گوێسوانەدا شۆڕ دەبێتەوە ۲. کۆڵەکەی شۆڕی ئاهەکی لە بن میچی مەغاردا.

**گلقند** / golqand/: [فارسی/ معرب]/اسم. گولقەن؛ مەرەبای خاکە قەند و گوڵەسوورە کە لە بەر تاوی دەنێن تا خەست دەبێتەوە و دەگا.

**گلکاری** / gelkārî/:اسم. قوڕەکاری؛ هەڕەکاری؛ هەریکاری؛ نەوالی: ۱. کار و ڕەوتی نقان؛ ماڵ‌کردنەوە ۲. کاری قوڕ گرتنەوە. هەروەها: **گِلکار**

**گلکاری** / golkārî/:اسم. گوڵکاری: ۱. کار و ڕەوتی ناشتن و پەروەردەکردنی گوڵ ‹جلو ساختمان را گُلکاری کرده بودند: بەردەم خانووبەرەکەیان گوڵکاری کردبوو›. هەروەها: **گُلکار** ۲. /ـها/ باخچەی گوڵ؛ ئەو جێگەی کە گوڵی تێدا نێژراوە ‹توی گُلکاری نروید گلها را لگد می‌کنید: مەچنە ناو گوڵکاریەکەوە گوڵەکان پێشێل ئەکەن›.

**گل کلم** / golkalam ، ـها/:اسم. گوڵەکەلەم؛ گوڵ‌کەلەرم؛ جۆرێ کەلەرمە گوڵەکەی زۆر گەورە دەبێ و بۆ ترشی بە کاری دەبەن.

**گلگشت** / golgašt ، ـها/:اسم. گەشت و گێل؛ پیاسە؛ کاری گەڕان لە ناو باخ و گوڵزاردا.

**گل ـ گلی** / golgolî/: صفت. *[گفتاری]* گوڵ ـ گوڵی؛ گوڵ‌ـگوڵ؛ گوڵ‌گوڵین؛ گوڵدار ‹یک پیراهن گل‌ـگلی پوشیده بود: کراسێکی گوڵ‌ـگوڵی لە بەر کردبوو›.

**گلگون** / golgûn/: صفت. گولباف؛ گوڵباو؛ ئاڵ و واڵ؛ بە ڕەنگی گوڵەسوورە.

**گلگونک** / golgûnak/:اسم. *[پزشکی]* سووریەکی ناحەز لە سەر گۆنا و لووتی بڕێ کەس (بەتایبەت پاش پەنجاساڵی) بە هۆی هەراو بوونی ڕەگی خوێنی.

**گلگونه** / golgûne/:اسم. *[قدیمی]* سووراو؛ سووراڤک؛ سوهراف؛ سۆراف؛ دەرمانی سووری تایبەت بۆ خۆ ڕازاندنەوەی ژنان.

**گلگی** / gelegî ، ـها/:اسم. *[گفتاری]* گله؛ گلەیی؛ گلەی؛ گلی؛ گلەه ؛ گله و بناشت.

**گلگیر** / gelgîr ، ـها/:اسم. گلگیر؛ قاپێکی کۆم لە دەوری تەگەرەی ماشێن بۆ بەرگری لە قوڕ پژان.

**گلگیرساز** / gelgîrsāz ، ـها؛ ـان/:اسم. گلگیرساز: ۱. کەسێ کە گلگیر دروست دەکا ۲. کەسێ کە گلگیری لار و خوار ڕێک دەکاتەوە.

**گلگیرسازی** / gelgîrsāzî/:اسم. گلگیرسازی: ۱. کار و ڕەوتی دروستکردن یان چاک کردنەوەی گلگیر ۲. /ـها/ کارگەیێ کە گلگیری تێدا دروست ئەکەن یان چاکی دەکەنەوە.

**گل‌مالی** / gelmālî/:اسم. کاری قوڕ تێدان؛ هەرگ ساوین؛ پێدا ماڵینی قوڕ: *الف)* بۆ خاوێن کردنەوەی دەفر ب) بۆ داپۆشینی شوێنێک.

▣ **گل‌مالی کردن**: ۱. قوڕ تێگرتن؛ بە قوڕ داپۆشان ۲. *[کنایی، گفتاری]* پا پێدا ساوین؛ سەر نیانەوە؛ شاردنەوە.

**گل‌مژه** / golmoje/:اسم. چینچک؛ باپشکێو؛ بێتک؛ پزدوک؛ چینچک؛ جوانکە؛ دگدگە؛ بوکل؛ بیتک؛ بووک؛ بووکک؛ بوویک؛ دیکلۆک؛ دیقلۆک؛ سینچکە؛ زیتکەزەلام؛ زیتکەسلام؛ چینچکەسلاوە؛ چنچکەسلاو؛ چیچکەسلام؛ قینچکەسلاو؛ قنچکەسلام؛ قنچکەسلاوە؛ سیتکەسەران؛ سلتەخۆلام؛ سیتکەزەلام؛ سیتکەسلاو؛ سیسکەسەلا؛ سیسکەسلاوە؛ سیتکەسەلام؛ سیچکەسلاو؛ سیچەسلاوە؛ سیچکەی سلاوە؛ سینچکەسلاو؛ زیپکەی چلکی

لە پیلووی چاودا.

**گـــل‌منگلـــی / golmangolî**/: *صـفت. [تعـریض، گفتاری]* حەف‌ڕەنگیلە؛ بە ڕەنگی زۆری بێ‌ماناوە ‹یـک پیـراهن گـل‌منگلـی پوشـیده بـود: کراسـێکی حەف‌ڕەنگیلەی لەبەر کردبوو›.

**گلمیخ / golmîx** ، ـها/: *اسم.* گوڵـمێخە؛ سـنگی ئاسن؛ بزماری گەورەی سەر وەک گوڵ لێ‌کـراو بۆ جل لـە سـەر هەڵواسـین ‹کُتش را بـه گلمیـخ آویزان کرد: کۆتەکەی بە گولمیخەکەوە هەڵواسی›.

**گلنــــار / golnār**/: *اسـم.* ۱. گلیــار؛ گوڵـــنار؛ گـوڵ‌هــەنار؛ گوڵـی داری هــەنار ۲. گوڵــەنار؛ گیـایێکی دەشـتەکی بـە گوڵـی سـووری وەک گوڵی هەنارەوە.

**گلنــاری[1] / golnārî**/: *اسم.* گلیـاری؛ ڕەنگـی سووری ڕۆشن.

**گلناری[2]**: *صفت.* گلیاری؛ بە ڕەنگی سووری کاڵ.

**گلنگــدن / galangadan** ، ـهـا/: [ترکـی] *اسـم.* کۆلاسـە؛ مقەنەزمـە؛ گەلـەنگ؛ گەلەنگـەدەن؛ میلەیەکی سەر لاری نێوقـەدی چـەک کـە بـە هات‌وچۆ، فیشەک دەخاتە نێو خەزێنەی چـەک و پووکەکەی فڕێ دەدا ‹تفنگ را برداشت و گلنگدن را کشید: تفەنگەکەی هەڵگرت و کۆلاسەی لێدا›.

**گل‌نم / golnam**/: *اسم.* نمتـک؛ گوڵـنم؛ پڕشـە ئاوی کەم و ورد ‹یک گل‌نم آب بزن و اتویش کـن!: نمتکێ ئاوی لێدە و ئوتووی بکە!›.

**گلو / galû**/: *اسم.* گەروو؛ گەڵـوو؛ گـەلوو؛ گـەرۆ؛ گەروی؛ گلوی؛ گلـوێ؛ گـەلی؛ گـەوری؛ گلـب؛ هەوک؛ هـەوگ؛ قـوڕگ؛ قـڕگ؛ قـوڕی؛ قـوڕوو؛ قوڕووگ؛ قورتاسە؛ نەوک؛ ئـەوک؛ نـاق؛ خـووز؛ حـەفک؛ ئـوک؛ بـین؛ ناقـڕێ؛ تەشـنی؛ تینـی؛ خەلالووک؛ گەلەلووک: ۱. ئەندامێ کـە دەم بـە سینگ و سـکەوە دەلکێنـێ ۲. بـەرمل؛ لوولـە؛ باریکەڕێی نێوان زارک و سکی هەر شتێک.

⊡ **گلو پارە کردن:** *[مجازی]* قـوڕگی خـۆ دڕیـن؛ دەنگ دڕاندن؛ قیڕاندن ‹بە خاطر تو داشـتم گلـو پارە می‌کردم: **لە بەر تۆ خەریک بووم** قوڕگی خـۆم دەدڕی›.

**گلـو پـیش کسـی گیـر کـردن:** *[مجـازی]* دڵ چەقینـە سـەر کەسـێ؛ یـەکجار خوازیـاری کەسێک بوون ‹گلویش پیش دختـر همسـایەشـان گیـر کـردە بـود: دڵـی چـەقیبووە سـەر کچـە جیرانەکەیانەوە›.

**گلو تازە کردن** ☜ **گلو تر کردن**

**گلـو تـر کـردن:** گـەروو تـەڕکردن؛ شـتێک خواردن یان (زۆرتر) خواردنەوە ‹بفرمایید گلو تـر کنید!: فەرموون گەروو تەڕ کەن!›؛ **گلو تازە کردن**

**گلو صاف کـردن:** کـۆکین؛ گـەروو/ سـنگ ساف‌کردن؛ پاک‌کردنەوەی قـوڕگ (بەتایبـەت بە کۆخین یان تف کردنەوە) ‹گلویی صاف کـرد و بە صحبت ادامە داد: کۆکی و درێژەی بە قسە دا›.

**از گلـو پـایین نـرفتن:** لـە گـەروو نەچوونـە خوارەوە: ۱. نەخواردن؛ قـووت نـەدان ‹هنـوز لقمە از گلویم پایین نرفتـە بـود: هێشـتا پاروو لـە گەرووم نەچووبوە خـوارەوە› ۲. پـێ نـەخوران/ نەخوریان ‹از دیروز چیزی از گلویم پایین نمـی‌رود: لە دوێنێوە هیچم پێ‌ناخوری›.

**از گلوی کسـی بریـدن:** *[مجـازی]* لـە دەمـی کەسێک گرتنەوە؛ لە کەسـێک گرتنـەوە؛ لـە بەشە خواردنی کەسێک دزینەوە ‹از گلـوی زن و بچەام بریدم و این ماشین را خریدم: لە دەمی ژن و منالەکەم گرتەوە و ئەم ماشینەم کڕی›.

**بە/ در گلـو پریـدن:** پەڕینـە قـوڕگ؛ پەڕینـە گەروو؛ پراینە گلۆەزێ؛ شتێ لە کتوپڕا چوونە ناو قوڕگ ‹قنـد پریـد بـە گلـویم: قەنەکـە پەڕیـە قوڕگم›.

**بە/ در گلوی کسـی ریخـتن:** ۱. دەرخـواردی کەسێک دان؛ بە زۆر کردنە زاری کەسـێکەوە ‹زهـر در گلـویش ریختنـد و او را کشـتند: ژاریـان دەرخـــواردی دا و کوشـــتیان› ۲. کردنـــە دەم کەسێکەوە ؛ خواردنی کەسێک دابـین‌کـردن

‹صبح تا شب زحمت کشیدم، پول درآوردم به گلوی شما ریختم: بەیانی تا شەو ڕەنجم دا، پارەم دەرهێنا و کردمە دەمتانەوە›.

**گلواژه** / golvāje ، ـها/: اسم. [مجازی، ادبی] وشەی جوان.

**گلوئی** / galû'î/ ☜ **گلویی**

**گلوبند** / galûband/ ☜ **گردن‌بند**

**گلوبول** / gulubûl/: [فرانسوی] ☜ **گُلبول**

**گلوبولین** / gulubûlîn/: [فرانسوی] ☜ **گُلبولین**

**گلوبین** / g(o)lubîn/: [فرانسوی] اسم. [شیمی] گلۆبین؛ جۆرێک پرۆتەیینە لە خوێندا، بە گەرما دەگرسێ و لە ئاودا ناتوێتەوە.

**گلودرد** / galûdard/ ☜ **درد**[2]

▣ **گلودرد دام**: پاڵتەک؛ گاوەناز؛ گاوکناس؛ گاوەناس؛ نەخۆشی گەرووی ئاژاڵ؛ جۆرێ نەخۆشی تایبەت بە شێوەی لوویێ لە ژێر ملی گاوە دەردێ، ناو شاخی تێغ دەدەن، خوێی تێدەکەن، چا دەبێتەوە.

**گلوسید** / g(e)losîd, gulusîd/: [فرانسوی] اسم. [شیمی] گلۆسید؛ ناوی گشتی هیدراتگەلی کەربون.

**گلوسینیم** / gelosînyom, g(e)losîn(i)yom/: [انگلیسی] ☜ **بریلیُم**

**گـل و شـل** / gel-o-šol/: اسم. شلۆپ؛ لۆرخ؛ لیلاف؛ لەنگێز؛ لەنگێزە؛ قوڕ و بەفراوێ کە بە هۆی بارینەوە دروست دەبێ ‹امروز همەجا گل‌وشل بود و کفش و لباسم کثیف شد: ئەمڕۆ هەموو شوێنێ شلۆپ بوو، کەوش و جلەکانم پیس بوون›.

**گلوکز** / gulûkoz, g(o)lukoz/: [فرانسوی] اسم. [شیمی] گلۆکۆز؛ قەندی ترێ؛ هیدرات کەربونی تاکەقەن کە لە هیدرۆلیزی نیشاستە و نەیشەکر بەرهەم دێ: **دکستروز**

**گلوکوم** / golûkom, g(u)lûkom/: [فرانسوی] اسم. [پزشکی] آب سیاه ☜ **آب**

**گلوگاه** / galûgāh ، ـها/: اسم. بەرملە؛ باریکەڕێ؛ تەنگەبەر؛ تەنگەوەر؛ ڕەهەندێک کە لەوێوە دەچێتە ناو جێ، شوێن یان شتێک ‹تنگەی دزلی گلوگاه اورامان است: دەربەندی دزلی بەرملەی هەورامانە›.

**گل و گردن** / gal-o-gardan/: اسم. [گفتاری] سەر و مل؛ مل و پۆرگ؛ دەوری مل ‹هوا سرد است گل و گردن بچەها را خوب بپوشان!: هەوا ساردە، سەر و ملی منداڵەکان جوان داپۆشە!›.

**گل و گشاد** / gal-o-gošād/: صفت. [گفتاری] فش و فۆڵ؛ دەلپ؛ دەلب؛ زۆر هەراو، بەتایبەت جل‌وبەرگ ‹یک شلوار گل‌و گشاد تنش بود کە دو نفر دیگر هم تویش جا می‌گرفتند!: شاڵوارێکی فش و فۆلی لە پێدا بوو دوو کەسی تریشی تێدا جێ دەبووەوە!›.

**گل و گوش** / gal-o-gûš/: اسم. سەر و گوێ؛ دەوری مل و هەر دوو گوێ ‹دستی بە گل و گوش بچە کشید: دەستێکی هێنا بە سەر و گوێی منداڵەکەدا›.

**گل و گیاه** / gol-o-giyāh/: اسم. گوڵ و گیا؛ گژ و گیا؛ گیا و گوڵ؛ ڕووەک ‹توی باغچە گل و گیاه کاشتە بودند: لە ناو باخچەکەدا گوڵ‌و گیایان کێلابوو›.

**گلوگیر** / galûgîr/: صفت. گەڵووگر؛ گەرووگر؛ هۆی گیرانی گەروو ‹لقمەی گلوگیر: پارووی گەرووگر›.

**گلوله** / gulûle, golûle ، ـها/: اسم. گولۆلە؛ گلۆلە؛ گرۆلیە: ۱. گزموولە؛ گولۆلی؛ خڕکەیێکی چکۆلە لە شیشە، بەرد یان کانزا ۲. گولۆلک؛ تۆپەلە؛ هۆپەلە؛ تۆپەڵ؛ هۆپەڵ؛ گرمۆتە؛ گرموولە؛ گولۆک؛ هەر شتێکی خڕی خڕیلانە ‹گلولە نخ؛ گلولەی برف: گولولە بەن؛ تۆپەڵەی بەفر› ۳. بەرک؛ گوللە؛ تیر؛ تەنێکی خڕیلەی کانزایی لە نووکی فیشەکدا.

▣ **گلولەی برف**: تۆپەڵە؛ هۆپەڵ؛ کولات؛ گوداڤەوری؛ تۆپەڵەی بەفر.

**گلولەی گل**: زواڵە؛ هۆپەلە؛ هۆپەڵ؛ ئۆپەڵ؛

تۆپه قوڕ؛ تۆپه‌ڵه قوڕ.
گلوله‌ی نخ: گلۆله؛ گلۆک؛ گولۆلـک؛ گلۆڵـه بـەن؛ قـاقیلۆک؛ تەختەسـاف؛ قاتمـه؛ گنـا؛ گـوڵمشـتک؛ گونـەڵ؛ گونۆڵـه؛ مـاکی بـەن؛ تۆپەڵێک لە بەنی بە سەریەکدا پێچراو.
▣ گلوله خوردن: تیر خوردن ☜ تیر
گلوله شدن: گرمۆڵه/ گرمووله/ گولۆڵه/ گلۆڵه بـوون؛ گـورپ‌کـردن؛ چوونـه یـەک و وەک تۆپەڵە لێهاتن ‹از سرما گلوله شده بود: له سـەرما گرموله بووبوو›.
گلوله کردن: خڕکردن؛ گولۆڵه/ گلۆڵه کردن؛ تۆپەڵ کردن؛ بە چەشنی گولولـه دەرهێنـان ‹کاغذ را گلوله کرد انداخت دور: کاغەزەکەی گولوڵه کرد و فرەی‌دا›.
به گلوله بستن: بەر گولله دان؛ دانه بـەر گولـه؛ بەستنه گولەوە؛ دەسڕێژکردن ‹تظاهرات را بـه گلوله بستند: ڕێ‌پێوانەکەیان بەر گولله دا›.
**گلوله‌باران** / gulûlebārān, golûle- ، ـها:/اسم. گوللـەباران؛ گولـەباران؛ کـاری لـە سـەر یـەک هاویشتن و تەقاندنی گولله ‹سنگر ما از همه طرف گلوله‌باران شد: مەتەرێزەکەمان لـە هـەموو لایێکـەوە گوللەباران کرا›.
**گلویی** / galûyî ، ـها:/اسم. کـەفشـۆر؛ دەراوی باریکەڵەی ئاو، لە ژێر خانووبەرەوە: **گلوئی**
**گله** / galle ، ـها:/اسم. ۱. گەلە؛ کەرک؛ گلیـەی؛ رەقە؛ کومەڵی ئاژەڵ و پاتاڵ ۲. *[تعریض]* گایەل؛ خێڵ؛ جەماوەر؛ کۆمەڵـه خەڵـکێکی زۆر ‹در باز شد و یک گله آدم ریختند توی حیاط: دەرگا کرایـەوە و گایەلێک ڕژانه نێو حەوشەوە›.
▣ گله‌ی اسب: ڕەوە؛ گەله ئەسپ.
گله‌ی پرنده: پۆل؛ کۆمەڵی باڵنده.
گله‌ی گاو: گاگەل؛ گایەل؛ ڕێن؛ گۆبار؛ نـاخر؛ گەلەگا؛ کۆمەڵی گا و مانگا.
گله‌ی گوسفند: ڕان؛ مێگـەل؛ ڕایـان؛ ڕییـەن؛ ڕێن؛ گونیه؛ کۆمەڵی پەز و بزن.

**گلـه** / gele ، ـهـا:/اسـم. گلـه؛ گلـەیی؛ گلـەی؛ گلەیێ؛ گیله؛ گلی؛ گلێی؛ گلـی؛ گێـره؛ گـازن؛ گازنده؛ سوو؛ گله و بناشت؛ باس و قسـەیێ کـە دڵمەندی یان ناڕەزایـەتی بێـژەر ڕادەگەیـەنێ: **گلایه**
▣ گله داشتن: گلەیی هـەبوون؛ دەم بـە گلـەیی بوون؛ گلەی بیەی؛ لە کـاری کەسـێ دڵـگیر بوون ‹آزاد از تو خیلی گله داشت: ئـازاد زۆر گلـەی لێت هەبوو›.
گله کـردن: گلـەیی‌کـردن؛ گلـەی‌کـەردەی؛ گوتنەوەی دڵڕەنجاوی خۆ ‹پیش شوهرم از مـن گله کرده بود: بـه لای مێردەکەمـەوە گلـەیی لـێم کردبوو›.
**گله** / gel(l)e/: [کردی]/اسم. *[گفتاری]* گلـه؛ گلـێ؛ گلار؛ گلاره؛ گلوێ؛ گواره؛ بۆڵ؛ زەنگەته؛ دەنکـه ترێی لە هێشوو کەنراوە.
▣ گله کردن: کردنه گلوێ؛ بۆڵەڕن‌کردن.
**گلـــه** / gole/: [کـردی]/اسـم. *[گفتـاری]* گولـــه؛ جێگەیەکی چکۆلە لە پانایییەکی گـەورەدا ‹یک گله جا نیست کتابم را بگـذارم: گولـه جێگایـەک نیـه کتێبەکەم دانێم›.
▣ گله به گله: ناوەـ ناوە؛ پەڵەـ پەڵە؛ جێگـه بـه جێگه ‹روز سیزده، مردم گُله به گُله در مسیر جـاده نشسته بودند: ڕۆژی سێزده، خەڵک ناوەــ نـاوە بـه قەراخ ڕێگادا دانیشتبوون›.
**گلـەدار** / galledār ، ـهـا؛ ـان:/اسـم. دەوڵـەتدار؛ ئاژەڵدار؛ دونیادار؛ خاوەنی مەڕ و ماڵات.
**گلـــەداری** / galledārî:/اسـم. تەرشـــداری؛ دونیاداری؛ ئاژەڵداری؛ کـاری ڕاگـرتن و بـەخێو کردنی مەڕ و ماڵات.
**گلـەگـزاری** / gelegozārî ، ـهـا:/اسم. گلـه و بناشت؛ گلـه و گازنـده؛ گلـەیی و بناشـت ‹بابا، عروسی که جای گله‌گزاری نیست: کاکە، زەماوەند خـۆ جێی گله و بناشت نیه›.
**گلـەمنـد** / gelemand ، ـان/: *صـفت.* دڵـمەن؛

گلەمەن؛ گلەمەند ‹خوب نیست مادرت از تو گلەمند باشد: باش نیە دایکت لێت دڵمەن بێت›. هەروەها: **گلەمندی**

**گلـی** / gelî/: صفت. گلین؛ گلی؛ هەڕین؛ هەڕگی؛ هەڕگین؛ قوری: ۱. قوڕاوی؛ هەڕگاوی؛ گلاوی؛ بە قوڕەوە تلاو ‹با آن کفشهای گلی نیا توی اتاق: بەو کەوشە قوڕاویانەوە مەیە ژووری› ۲. ـهاـ/ سواڵەت؛ لە گڵ دروستکراو ‹مجسمەی گلی؛ کوزەی گلی: پەیکەری گڵی؛ گۆزەی سواڵەت›.

**گلی**[1] / golî/: اسم. سوورکاڵ؛ ئاڵ؛ سوورئاڵ.

**گلی**[2]: صفت. گوڵڕەنگ؛ ئاڵ؛ بە ڕەنگی سووری کاڵ.

**گل یخ** / goleyax، ـها/: اسم. دەوەنێکی جوانە بە گوڵی سپی بۆنخۆشەوە کە لە سەرەتای زستانەوە تا هەواخۆشی بەهار گوڵ دەکاتەوە.

**گلیسرین** / gelîsirîn, g(i)lîserîn/: [فرانسوی] اسم. گلیسرین؛ تراوێکی خەست و شیرین و بێڕەنگە کە لەگەڵ ئاودا تێکەڵ دەبێ و لە هیدرولیزی چەوری بەرهەم دێ و لە پیشەسازیدا زۆری کەڵک هەیە: **گلیسیرین**

**گلیسمی** / g(e)lîsemî/: [فرانسوی] اسم. [پزشکی] گلایسیمی؛ هەبوونی گلۆکۆز لە خوێندا.

**گلیسیرین** / gelîsirîn, g(i)lîsirîn/: [فرانسوی] ☜ **گلیسرین**

**گلیکوژن** / g(e)lîkojen, gilîkojen/: [فرانسوی] اسم. [شیمی] گلیکۆژن؛ نیشاستەی گیانەوەری؛ هیدرات کەربونی نێو ئەندامی گیانەوەران، بەتایبەت لە جەرگدا: **هیپاتین**

**گلیم** / gilîm, gelîm، ـها/: اسم. بەڕە؛ بەڕ؛ بەڕ؛ وەڕ؛ گلێم؛ گلیم؛ کلیم؛ گلێمە؛ مەڕت؛ مەرش؛ سپیاڵ؛ لەی؛ لی؛ هەپک؛ وەرچنی؛ ڕایەخێکی ئەستوورە لە تانی بەن و پۆی خوری، بە نەخش و نیگاری جۆراوجۆرەوە کە دارەتەونی بۆ هەڵدەخرێ و بە دەست دەچنرێ.

⊡ **گلیم خود را از آب بیرون کشیدن:** [کنایی] بەری خۆ لە ئاو کێشانەوە/ پەڕاندنەوە؛ لە ئۆدەی کاری خۆ هاتن ‹هر طور باشد می‌توانم گلیم خودم را از آب بیرون بکشم: هەر چۆنێک بێ دەتوانم بەری خۆ لە ئاو بکێشمەوە›.

**گلیم‌بافی** / gilîmbāfî, gelîm-/: اسم. کار، لێزانی یان هونەری بەڕە تەنین؛ بەڕکردن؛ بەڕە چنین. هەروەها: **گلیم‌باف**

**گم** / gom/: صفت. بزر؛ بەرزە؛ بزرە؛ گوم؛ گم؛ گووم؛ ون؛ شرت؛ وندا؛ هندا؛ پیوار؛ مەرست؛ پێوار؛ بە دۆخ یان چۆنیەتیەکی نادیارەوە ‹او در میان آن همە جمعیت گم بود و دیدە نمی‌شد: لە نێو ئەو هەموو جەماوەرەدا بزر ببوو، نەدەبینرا›.

⊡ **گم بودن:** ون بوون؛ گوم بوون؛ بزر بوون؛ گم بیەی؛ هێلاندش؛ نادیار بوون؛ نەدیار یان نوقم بوون. هەروەها: **گم شدن**

**گم کردن:** ون‌کردن؛ گوم‌کردن؛ هێلاندن؛ هلیاندن؛ بەتلاندن؛ گم کەردەی ‹کیفم را گم کردم: جانتاکەم ون کرد›.

**گمار** / gomār/: اسم. سوورگوم؛ سەراگوم؛ شوێنی نائاشنا، بەتایبەت دارستانی چڕ و پڕ کە ڕێ لە مرۆ دەشێوێنێ.

**گماردن** / gomārdan/ ☜ **گماشتن**

**گماشتن** / gomāštan/: مصدر متعدی. //**گماشتی:** داتنا ؛ **می گماری:** دادەنی ؛ **بگمار:** دانێ // دانان؛ دانیان: ۱. دامەزراندن؛ دامەرزاندن؛ مەرزاندن؛ مەزراندن؛ ئەرمەمەرزنەی؛ مەرزنایرە؛ کارێ بە کەسێ دان ‹بە ریاست گماشتن: بە سەرۆکایەتی دانان› ۲. داسپاردن؛ ئەرەنیەی؛ نیایرە ‹او را سر کوچە گماشت کە مواظب خیابان باشد: ئەوی لە سەر کۆڵانەکە داسپارد چاوی بە شەقامەکەوە بێ› * **گماردن**. هەروەها: **گماشتنی**

■ صفت فاعلی: **گمارندە** (دانەر)/ صفت مفعولی: **گماشتە** (دانراو)/ مصدر منفی: **نگماشتن** (دانەنان)

**گماشتە** / gomāšte، ـها/: اسم. [قدیمی] بەردەست؛ خزمەتکار؛ سەربازی ڕاسپێراو بۆ نۆکەری ماڵە

ئەفسەرێک.

**گمـان** / gomān, gamān ، ـها/:/سم. هـەدان؛ هێدان؛ گومان؛ گومانە؛ گمانە؛ گۆمـان: ۱. سـۆ؛ سوو؛ دۆنگی؛ ڕوێز؛ بیر و بۆچـوونێکی نـەک بـە دڵنیایی ۲. شک؛ دڕدۆنگی؛ دوودڵی.

▣ گمان بردن ☜ **گمان کردن**

**گمان داشتن:**/ادبی/ پێ وا بوون؛ وا زانـین؛ بـە گومان بوون ‹گمان داشت که می‌توانـد هـر کـاری بکند: پێی وا بوو دەتوانێ هەموو کارێک بکا›.

**گمان رفتن:**/ادبی/ ڕێ تێچوون؛ جێ بڕوا بوون ‹چنین گمان نمی‌رفت: ئاوا ڕێ تێ نەدەچوو›.

**گمان کردن:** وا زانـین؛ پـێ وا بـوون؛ گومـان کردن؛ ئەجیەی؛ ئەجیای ‹گمان می‌کـرد کسـی پشت در ایستاده است: وای دەزانی یەکێ لە پشـت دەرکەوەیە›: **گمان بردن**

**گمانه** / gomāne, gamāne ، ـها/:/سم. ۱. کـون، چاڵ یان کەلێنێک بـۆ پێـزانینی شـتێک (وەک شـوێنەواری کـەونارا) ۲. پێکـۆڵ؛ کەرسـتەی هەڵکەندن و کۆڵین.

**گمانه‌زنی** / gomānezanî, gamāne- ، ـها/:/سم. ۱. پەیدۆزی؛ گومانە؛ گەمانە؛ کار و ڕەوتی کون، چاڵ یـان کـەلێن تـێ‌کـردن لـە شـوێنێکدا بـۆ لێکۆڵـینەوەیەک ۲. بـەراورد؛ کـار و ڕەوتی لێکدانـەوە، تـاقی‌کردنـەوە و بـە خـەیاڵ هەڵسەنگاندن.

**گمراه** / gomrāh ، ـها؛ ـان/: صفت. لاڕێ؛ هەتلـە؛ هەلە؛ گومڕا؛ گومڕە؛ کلابوو؛ سەر لێ شـێویاگ؛ ڕێ‌گوم‌کردوو: ۱. لێچ؛ بێقام؛ لـە ڕێ دەرچـوو؛ داچوو؛ سەرڕێ؛ ئاقـاڕێ؛ ڕێ‌لـێ‌گـۆڕاو؛ ڕێ لـێ تێکچوو ۲. /کنایی/ لە دین دەرچوو.

▣ **گمراه شدن:** گومـڕا بـوون؛ لاڕێ بـوون؛ کـلا بوون؛ خریان؛ سەر لـێ شـێویان؛ بـە هەڵـەدا چـوون: ۱. لـێچ بـوون؛ لـە ڕێ دەرچـوون ۲. کردەوەی دزێو و دژ لە بایەخ گرتنـە بـەر. هەروەها: **گمراه کردن**

**گمراهـی** / gomrāhî ، ـهـا/:/سم. گومـڕایی؛ کلایی؛ سەر لێ شێویاگی: ۱. دۆخی ونکـردنی ڕێ ۲. لاڕێیـی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی نـەزانینی ڕەوشتی ژیان و نەناسینی بایەخە ئاکاریەکان.

**گمـرک** / gomrok/: [پرتغـالی]/سـم. گـومرک؛ گومریک: ۱. /ـها/ مەرزینگـەی چاودێری لـە هـات‌وچـۆی کـەل‌وپـەل (هـاوردە و هـەناردە) و گرتنی مافی گومرکی لە خاوەنەکانیان ۲. /ـات/ ماف و مەزاختەی گومرکی ‹لوازم آرایشـی گمـرک زیادی دارند: کەلپەلی ڕازێنەری گومرکیان قورسە›.

**گمرکچی** / gomrokčî ، ـها؛ ـان/: [پرتغالی/ ترکی] /سم. گومریکڤـان؛ گومرکـوان؛ کارگێـڕی مەزرینگەی گومریک.

**گمرکی** / gomrokî/: [پرتغالی] صفت. گـومریکی؛ سەر بە گومرک ‹عـوارض گمرکـی: بـاج و پیتـاکی گومرکی›.

**گمشده** / gomšode ، ـها؛ ـگان/: صفت. ونـدابوو؛ بزربوو؛ گوم‌بوو ‹بچەی گمشده؛ کیف گمشده: منداڵی گوم‌بوو؛ کیفی ون‌بوو›.

**گمنام** / gomnām/: صفت. کەس‌نەناس؛ گومناو: ۱. ون؛ بێناو؛ نەبناڤ؛ سەراگوم؛ نەشناس ‹سرباز گمنـام: سـەربازی ون› ۲. /مجـازی/ نەناسـراو؛ بێ‌ناوبانـگ؛ بـێ‌دەنـگ و نـاو ‹نویسـندەی گمنام: نووسەری نەناسراو›.

**گمنـامی** / gomnāmî ، ـهـا/:/سم. سـەراگومی؛ گومنـاوی؛ کـەس‌نەناسـی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی بێ‌ناو و نیشان بوون.

**گـم‌و‌گـور** / gom-o-gûr/: صـفت. /تعـریض/ شـرت‌وگـوم؛ گومەسـار؛ گمەسـار؛ بەڵـگ‌وبـن؛ بێ‌سەر و شوێن/ شۆن ‹یک روز رفـت و گـم‌و گـور شد: ڕۆژێک ڕۆیشت و شرت و گوم بوو›. هـەروەها: **گم و گور شدن؛ گم و گور کردن**

**گن** / gen ، ـها/: [فرانسوی]/سم. سکوێن؛ سکبەن؛ گێن؛ ژێرجلی ژنانە (وەک شـاماکی)، بۆ بـەرگری لە داشۆڕانی گەدە و گیپاڵ.

**گناه** / gonāh ، ـها؛ ـان/:/اسم. تاوان؛ گونا؛ گوناح؛ گوناه ؛ گونەه ؛ گوناد؛ گوناسە؛ گوناسا؛ بەزە؛ هەڵە؛ فیت؛ فیک؛ پیازە؛ سووچ؛ ئۆباڵ؛ ئازوبەزە؛ وەباڵ؛ قۆڕن: ١. کاری ناڕەوا لە چاو دین کە شیاوی سزایە ‹گناه کبیره: تاوانی گەورە› ٢. کردەوەی ناڕەوا لە ئاست خەڵک ‹بچه را اذیت نکنید گناه دارد: منداڵەکە ئازار مەدەن گونای هەیە› ٣.*[گفتاری]* کردەوەی دژ بە قانوون ‹گناه من چرا؟ خودش زمین خورد: سووچی من بۆ؟ خۆی کەوت›.

▣ **گناه صغیره:** گونای بچووک؛ سووچی گچکە؛ گوناحی وا کە بە کەفارە یان سزا پا دەبێتەوە.
**گناه کبیره:** تاوانی گەورە؛ تاوانێ کە سزای توند و تۆبەی لە سەرە.

▣ **گناه داشتن:** ١. گونابار/ تاوانبار بوون؛ ئۆباڵ وەئەستۆ بوون ٢. گوناح بوون؛ ناڕەوا بوون ‹این کار گناه دارد: ئەم کارە گوناحە› ٣.*[گفتاری]* خوا هەڵنەگرتن؛ خوا ڕابەردار نەبوون ‹این پیرزن گناه دارد کارش را راه بینداز!: خوا هەڵناگری کاری ئەم پیرەژنە جێبەجێ بکە!›.
**گناه کسی را به گردن گرفتن:** چوونە ژێر تاوانی کەسێ؛ ئۆباڵی کەسێ وە ئەستۆ گرتن ‹گناه او را به گردن گرفتم و گفتم شیشه را من شکستم: چوومە ژێر تاوانی و کوتم من شووشەکەم شکاندووە›.
**گناه کسی را شستن:** *[مجازی]* ناو و ناتۆرە بە کەسێکەوە نان؛ کەسێ تۆمەتبارکردن ‹تو که خبر نداری، چرا گناه مردم را می‌شوری؟: تۆ خۆ بێخەبەری، بۆ ناو و ناتۆرە ئەنەی بە خەڵکەوە؟›.
**از گناه کسی گذشتن:** لە گوناهی کەسێک خۆش بوون؛ لە هەڵەی کەسێک چاو پۆشین ‹این بار از گناهت می‌گذرم به شرطی که دیگر تکرار نشود: ئەمجارە لە گوناهت خۆش ئەبم بەو شەرتەی دووپات نەبێتەوە›.

**گناهکار** / gonāhkār ، ـها؛ ـان/: صفت. تاوانبار؛ تاواندار؛ سووچدار؛ گوناهبار؛ گونابار؛ گونادبار؛ گوناکار؛ هەڵەبار؛ خاوەن کردەوەی دژ بە دین یان قانوون ‹قاضی او را گناهکار دانست: داوەر بە تاوانباری دەرکرد›.

**گنبد** / gombad, gonbad ، ـها/: [آرامی]/اسم. گومەز؛ گومبەز؛ گوممبەت؛ گونبەت؛ گومبەد؛ گومە؛ گومگ؛ قوببە؛ قوبە؛ کل؛ میچی نێو تۆپ.

**گنبدی** / gombadî, gonbadî/: [آرامی] صفت. گومەزی؛ گومبەزی؛ لە بیچمی گوممبەت.

**گنج** / ganc ، ـها/:/اسم. گەنج: ١. کۆمایەکی زۆر و زەبەند لە شتی گرانبایی (وەک سکە، زێڕ، زیو، شتی کۆن و...) کە لە شوێنێکدا شاردراوەتەوە ٢. سامان؛ گەنجینە؛ خەزێنە؛ خەزینە؛ خەزنە؛ خزنە؛ سەرچاوکەی سامانی زۆر (وەک سەرچاوەی سروشتی).

▣ **گنج بادآورده:** *[مجازی]* گەنج و سامانێ کە بەبێ هەوڵ و ماندوو بوون دەست کەوتبێ.
**گنج شایگان:** گەنجی گەورە و گرانبایی.
**گنج قارون:** *[کنایی]* گەنجی قاروون؛ سامانی زۆر.

**گنج** / gonc/:/اسم. گونج؛ بارست؛ بارستایی؛ ڕادەی جێ‌کردنەوەی شتێک.

**گنجا** / goncā/: صفت. گونجا؛ دیرا؛ خاوەنی گونجیان و دێران ‹لیوان گنجا؛ سالن گنجا: لیوانی دیرا؛ سالۆنی گونجا›.

**گنجاندن** / goncāndan/: مصدر. متعدی. //**گنجاندی:** گونجاندت؛ **می‌گنجانی:** دەگونجێنی؛ **بگنجان:** بگونجێنە // گونجاندن؛ گونجانن؛ خونجانن؛ خونچانن؛ خونچاندن؛ ئەنەگونجنەی؛ گونجنای؛ جێگەدان؛ دامەزرانن؛ شتێ دە نێو شتێکی‌تردا جێ‌کردنەوە: **گنجانیدن**. هەروەها: **گنجاندنی**

■ صفت فاعلی: **گنجاننده** (گونجێنەر)/ صفت مفعولی: **گنجانده** (گونجێنراو)/ مصدر منفی: **نگنجاندن** (نەگونجاندن)

**گنجانیدن** / goncānîdan/ ☜ **گنجاندن**

**گنجـــایش** / goncāyeš/:اسـم. گـونج؛ خـونج؛ دۆخی دیـران؛ گونجـان؛ خونجـان؛ خونجیـان: ۱. توانـایی لـه خـۆدا جـێ‌کردنـەوە ‹چهـل لیتـر گنجـایش دارد: چـل لیتـر نـەدیری› ۲. هەلـگرتن؛ توانـایی یـان شـیاوی وەرگـرتنی بـار و دۆخـێ ‹گنجایش شوخی ندارد، زود عصبانی می‌شـود: شـۆخی هەلناگری، زوو توورە دەبێ›.

**گنجشک** / gonceŝk, gonceŝg ، ـها؛ ـان/:اسـم. چۆلەکە؛ چوێلەکە؛ مەلیچک؛ ملیجک؛ مریچک؛ مریچکـــە؛ مریچلـــە؛ مـــەلووچک؛ مەلیچلـــێ؛ میچلێ؛ مریچلێ؛ مۆرووچلێ؛ چیچک؛ چێژیلـە؛ چیک؛ چیچکا؛ چیریلە؛ چیجک؛ چویچ؛ چڤیک؛ چڤینک؛ جکە؛ جووجک؛ پاسـاری؛ سـواندولکە؛ سواندیلکە؛ ساندیلکە؛ چڤیک؛ چویک؛ تیڤـۆک؛ میرچک؛ مەلیچـە؛ سـەرچە؛ چومـک؛ چـووک؛ چوچک؛ چێشـکە؛ کێشـکە؛ کێشـوولە؛ کێژکـە؛ کیژکە؛ کێژوولـە؛ کوێژکـە؛ کوێژیلـە؛ کوێشـکە؛ کیشـکە؛ شڤـاندیلکە؛ سـواندوولکە؛ سـواندیلکە؛ سێڤاندیلکە؛ سێڤاندۆک؛ سێڤاندۆکە؛ سواندۆکە؛ ســـواندووکە؛ بەیتـــەک؛ بـــەیتاک؛ بێتـــک؛ بالندەیەکی چکۆلەی دان‌خـۆرە بـە دەنـدووکی خڕۆکە و پێـی کورتـەوە، لـە زەوی یـان کـونی دیـوار و سـەر لقـی داران هێلانـە دەکـا، نـزم و کورت دەفڕێ: **گنجشگ**

**گنجشـک‌پـر** / gonceŝkpar, gonceŝg- /:اسـم. قالاوفـڕ؛ قەلەفـڕ؛ گەمەیـەکی بـە کۆمەڵـی منداڵانەیە، سـەرمەلا (یـەکێکی گـەورە) قـامکی شـادەی دادەنـێ و بـاقیش چـاوی لـێ‌دەبـڕن، ئەمجار دەڵێ: «فڕی-فـڕی، قـەل فـڕی، مـێش فڕی، کتێـب فـڕی، ... و بـۆ هـەمووی قـامکی هەڵدێنێ» منداڵان دەبێ بـۆ هـەرچی دەفـڕێ قامکیان هەڵێنن و بـۆ ئـەوی نافـڕێ دەسـتیان نەبزوێ، هەرکی لێ تێکچوو دەسووتێ: **کلاغ‌پر**

**گنجشک‌روزی**/ gonceŝkrûzî,gonceŝg- ، ـها/: صفت. [مجازی] ڕزق‌کوێر؛ بـێ‌نسـیو؛ کـەم‌بـەش؛ بێوەری و کەم داهات.

**گنجشگ** / gonceŝg/ ☜ **گنجشک**

**گنجفـه** / gancafe/:اسـم. [قـدیمی] گەنجەفـە؛ جۆرێ کایەی وەرەق.

**گنجنامـه** / gancnāme ، ـها/:اسم. گەنجنامـە؛ نەخشـەی گەنج؛ نەخشـە یـان نووسـراوەیێ کـە ناونیشانی گەنجی دابێ.

**گنجـــواژه** / gancvāje ، ـهـا/:اسـم. وشـــەدان؛ پـــەرتووکی وشـــە، بـــریتی لـــە وشـــە، واتـــا و هاواڵەکانی.

**گنجه** / gance ، ـها/:اسم. گەنجە: ۱. خەڵوەتی؛ کومیدی ناو دیوار ۲. کومێد (بەتایبەت گـەورەی بە قەد بالاپیاوێک).

**گــنج‌یــاب** / gancyāb ، ـهـا/:اسـم. گـەنجدۆز: ۱. کەســێ کــە لــە دووی گــەنج دەگــەڕێ ۲. کەرەستەی گەنج دۆزینەوە.

**گنجیدن**/ goncîdan/: مصدر. لازم. // **گنجیـدی**: گونجای؛ **می‌گنجـی**: دەگـونجی؛ **بگـنج**: بگونجـە// گونجـــان؛ گونجیـــان؛ گـــونجین؛ گونجیـــای؛ خونجان؛ خونجیان؛ لە نێو شتێکدا جێ بوونەوە. هەروەها: **گنجیدنی**

■ صـفت فـاعلی: **گنجنـــده** (ـــ)/ صـفت مفعـولی: **گنجیـــده** (گونجـــاو)/ مصـدر منفـی: **نگنجیـــدن** (نەگونجان)

**گنجینه** / gancîne ، ـها/:اسم. گەنجینە؛ خەزێنە: ۱. نەختینـە؛ خەزانـە؛ خزنـە؛ گـەنج؛ خەزەنـە؛ شوێنی هەڵگرتن و ڕاگرتنی گەنج ۲. سامانگە؛ نەختینە؛ خەزانە؛ خزنە؛ گەنج؛ خەزەنە؛ مەکۆی شـتێ گرانبـایی ۳. کۆمەڵـە شـتی بایەخـدار ‹گنجینەی لغت: خەزینەی وشە› ٤. مۆزە؛ مووزە.

**گنـد**[1] / gand/:اسـم. گـەن؛ گەنـد: ۱. بۆگـەن؛ بۆسار؛ بۆگەنیو ۲. گەنیو؛ گەنیگ؛ خراپ؛ شـتی پیس و بۆگەن.

▣ **گند بالا آوردن**: [مجازی] پەن دان؛ کاری زۆر ناشیرین‌کردن و هۆی بێ‌ئابڕوویی بـار هێنـان

‹با این رشوه گرفتن گند بالا آورد: بەم بەرتیل سەندنەی پەنی دا›.

**گند چیزی درآمدن:** ۱. بۆگەنی شتێ هەڵسان؛ زۆر خراپ تێکچوون ۲. *[کنایی]* گەنی شتێ دەرهاتن؛ تەق لە شتێ هەستان؛ بوونە هۆی بێئابڕوویی. هەروەها: **گند چیزی را درآوردن**

**گند زدن** ☜ **به گند کشیدن**

**به گند کشیدن:** گەناندن؛ گەنانن؛ خراوکردن: ۱. پیس‌کردن؛ لەوتاندن ‹خانه را به گند کشید: ماڵەکەی گەناند› ۲. بێئابڕوو یان بەدناوکردن

❋ **گند زدن**

**گند**[2]: *صفت.* گەن؛ گەند: ۱. پیس؛ خراپ (زۆرتر بۆن) ‹بوی گند: بۆی گەن› ۲. *[گفتاری]* ناحەز؛ ناخۆش ‹آدم گند؛ هوای گند: مرۆی ناحەز؛ هەوای ناخۆش›.

**گنداب** / gandāb ، ـها/: *اسم.* گەنکاو؛ گەناو؛ ئاوی پیس و بۆگەنیو.

**گندابرو** / gandābrow ، ـها/: *اسم.* ئاوەڕۆ؛ گونج؛ گونجە؛ ڕەهەن؛ ڕەهەند؛ ئاوەڕۆیەک بۆ دەرکردنی گەناو.

**گنداندن** / gandāndan/: *مصدر. متعدی.* // **گنداندی:** گەناندت؛ **می‌گندانی:** دەگەنێنی؛ **بگندان:** بگەنێنە // گەناندن؛ گەنانن؛ گەننەی؛ گەنناي؛ هێشاندن؛ خراپ‌کردن؛ بوونە هۆی گەنینی شتێک ‹میوەها را می‌گندانی و می‌ریزی دور: میوەکان دەگەنێنی و فڕەیان دەدەی›: **گندانیدن**. هەروەها: **گنداندنی**

■ صفت فاعلی: **گندانند**ه (گەنێنەر)/ صفت مفعولی: **گندانده** (گەنێنراو)/ مصدر منفی: **نگنداندن** (نەگەناندن)

**گندانیدن** / gandānîdan/ ☜ **گنداندن**

**گندخونی** / gandxûnî/: *اسم. [پزشکی]* دۆخی سەر هەڵدان و پەرە سەندنی باکتری لە خوێندا.

**گندروی** / gandrûy ، ـان/: *صفت. [زیست‌شناسی]* بە تایبەتمەندی ڕوان لە نێو ماکی زیندەڵی گەنیودا (وەک بڕێ کارگ و باکتری): **کودرست**

**گندزدا** / gandzedā ، ـها/: *صفت.* دژگەن؛ گەن‌بەر؛ نەزۆکار؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی لە ناو بردنی گەنی.

**گندزدایی** / gandzedāyî ، ـها/: *اسم.* دژگەنی؛ گەن‌بەری؛ بەرگری لە سەرهەڵدانی چڵک و ڕیم و گەشەکردن و پەرە ساندنی میکرۆب.

**گندگی** / gondegî/: *اسم. [گفتاری]* زلی؛ زەلامی؛ دۆخ یان چۆنیەتی زل بوون ‹این درخت، زردآلو می‌آورد به گندگی پرتقال: ئەم دارە قەیسی ئەدا بە زلی پرتەقاڵێک›.

**گندله** / gondole ، ـها/: [از کردی] *اسم.* گونەڵە؛ گوندەڵە: ۱. بەرهەمی خڕ و گرۆڤەری لە کانزا ۲. *[قدیمی]* ئاور؛ تۆپەڵەی خاکەزوخاڵ بۆ گەرم کردنەوەی ژێر قورسی.

**گندم** / gandom ، ـها/: *اسم.* گەنم؛ گەندم؛ گەنەم؛ گەنمێ: ۱. گیای ئاڵێکی بە ساقەتەی گرێ‌ـ گرێ و هلۆل، گەڵای درێژ و بەری زەردی بچووکەوە ۲. دەنکی ئەو گیایە کە دەیهاڕن و ئاردەکەی دەکەنە نان و بژێوی مرۆڤە ۳. یەکەی کێش بەرامبەر بە ۰٫۰٦٤٨ گرەم: **گِرین**

**گندمزار** / gandomzār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* گەنم؛ گەنمزار؛ مەزرای گەنم.

**گندمک** / gandomak/: *اسم.* برێشکە؛ دانەبرێشکە؛ گەنمە؛ گەنمی لە سەر ساج برژاو.

**گندمگون** / gandomgûn/: *صفت.* سەوزە؛ ئەسمەر؛ گەندمی؛ زەری؛ گەرەن‌زەر؛ قەمەر؛ گەور؛ گەنم‌ڕەنگ؛ بە ڕەنگی قاوەییەکی زۆر کاڵ (زۆرتر بۆ پێستی لەش دەگوترێ).

**گندمه** / gandome ، ـها/: *اسم. [قدیمی]* گەنمە؛ گەندمە؛ بالووک؛ بالووکە؛ بایلە؛ ئازەخ؛ پالوو؛ سگڵ؛ دیاردەیەکی ویرووسی بە شێوەی هەڵتۆقاوی ورد و درشت بە سەر پێستەوە.

**گنده** / gande/:*اسم. [گفتاری]* گەنیو؛ گەنی؛ گەنیگ؛ خۆراکی خەسار بووگ.

**گنده** / gonde ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* زل؛ زلە؛ گەورە؛ زەلام؛ زلام؛ زرپ؛ زرت؛ زڕ؛ جەبلە؛ قەپ؛ قەپە؛ قەبە؛ گەپ؛ کەت؛ خەلگانوگۆشت ‹سیب گنده؛ ماشین گنده: سێوی زل؛ ماشینی گەورە›.

**گندەبک** / gondebak ، ـها/: *صفت. [تعریض]* زلحۆرت؛ زلحۆ؛ تاپاز؛ زەبەلاح ‹پسرەی گندەبک از خودش خجالت نمی‌کشد: هەتیوە زلحورتە داناپزێ›.

**گندەخور** / gandexor ، ـها/: *صفت.* هەڵەخۆر؛ پیس‌خۆر؛ چەپەڵ‌خوەر؛ گەندەخۆر؛ گەن‌خۆر؛ بخۆری شتی پیس و گەنیو.

**گندەدماغ** / gondedamāq ، ـها/: *صفت. [تعریض]* فیزن؛ فیسن؛ لووت‌بەرز؛ ترزل؛ لە خۆبایی و خۆ بە شت زان.

**گندەگوزی** / gondegûzî/ ☜ **گندەگویی**

**گندەگویی** / gondegûyî ، ـها/:*اسم. [گفتاری]* لاف و گەزاف؛ شات و شووت؛ قسەی فڕ و فیشاڵ: **گندەگوزی** *[مستهجن]*

**گندی** / gondî/:*اسم.* گۆندی؛ لە زبانە دراویدیەکان کە لە هێندی ناوەندیدا قسەی پێدەکەن.

**گندیدگی** / gandîdegî ، ـها/:*اسم.* گەنیوی؛ گەناژۆیی؛ گەنیگی؛ گەنیاگی؛ دۆخ یان چۆنیەتی گەنیو بوون.

**گندیدن** / gandîdan/: *مصدر. لازم.* // **گندیدی:** گەنیت؛ **می‌گندی:** دەگەنی؛ **بگند:** بگەنە // گەنین؛ گەنان؛ گەنیان؛ گەنەی؛ گەنای؛ خلم کرن؛ خلمکیان؛ خلمکیای؛ هێشان: ۱. خراپ بوونی ماکی خۆراکی بە هۆی تێدانی باکتری و گۆڕانی تام و ڕەنگ و بۆنی ‹گندیدن سیب: گەنینی سێو› ۲. ڕزین؛ قنین؛ لە بەر یەک چوون و خرا بوونی ماکی زیندەڵ بە هۆی تێ‌رووژانی باکتری ‹جنازەاش توی خانه مانده و گندیده بود: لاشەکەی لە نێو ماڵدا مابۆوەوە و گەنیبوو›. هەروەها: **گندیدنی**

■ صفت مفعولی: **گندیده** (گەنیو)/ مصدر منفی: **نگندیدن** (نەگەنین)

**گندیده** / gandîde ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* گەنیو؛ گەنیا؛ گەنیاگ؛ گەناو؛ گەنا؛ گەندڕ؛ گەنی؛ گەنیگ؛ کێفکی؛ ئاشاخە؛ گەنیاو؛ کتکی؛ خەم‌خمۆتە؛ گنخاو؛ حەفتر؛ حەف؛ حەفار؛ کوففک؛ زنخ؛ هەفنی ‹سیب گندیده: سێوی گەنیو›.

**گنگ**[1] / gong/ ☜ **تام ـ تام**

**گنگ**[2]: *صفت.* ۱. *[نامتداول]* لاڵ؛ بەبێ توانایی قسەکردن ۲. لێل؛ ونگ؛ گۆم؛ ناڕوون؛ مانا نەزانراو ۳. عدد گنگ ☜ **گنگ**

**گنگی** / gongî/:*اسم.* ۱. لاڵی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لاڵ بوون ۲. لێلی؛ ونگی؛ گۆنگی؛ گۆمی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ئاڵۆز و ناڕوون بوون.

**گنوستی‌سیسم** / g(e)nostîsîsm/: [فرانسوی]/*اسم.* گینۆستی‌سیزم؛ هەر کام لە دین و بڕواکانی پێش و پاش لە زایینی مەسیح کە شوێنکەوتووانی، تێگەیشتوویی و سەربادان لە ڕکێفی لەشیان مەرجی بەختیاری و ڕزگاری مرۆڤ دەزانێ.

**گنوستیک** / g(e)nostîk ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی] *صفت.* گنۆستیک: ۱. شوێنەڕا و لایەنگری گنۆستی‌سیزم ۲. ☜ **گنوستیکی**

**گنوستیکی** / g(e)nostîkî/: [فرانسوی] *صفت.* سەر بە گنۆستی‌سیزم: **گنوستیک**

**گنه** / gonah/:*اسم. [مخفف]* گونا؛ گوناه ؛ سووچ. هەروەها: **گنهکار**

**گنه‌ـگنه** / ganegane ـها/ : [از لاتینی]/*اسم.* گەنە‌ـگەنە؛ یاوکوژە؛ دەرمانەلەرز؛ قەنەقینە؛ دارێکی دایمە شین، تایبەتی ناوچەی گەرم و شێدارە کە تێکوڵەکەی ماکی کینین، دەرمانی گەنە‌ـگەنەی تێدایە و دژی یاو و لەرزە.

**ـ گو** / gû/: *پیواژه.* ـ بێژ؛ ـ وێژ؛ ـ واچ؛ بێژەر؛ کەسێ کە شتێک دەڵێ ‹راستگو؛ سخنگو:

ڕاستویژ؛ قسەبێژ›.

**گواتر / gûvātr, govātr/:** [فرانسوی]/*اسم.* *[پزشکی]* گواتر؛ زەریکە؛ نەخۆشی گەورە بوونەوەی لووی تیرۆئید بە بۆنەی کەم بوونی یود لە لەشدا.

**ـ گوار / govār/:** *پیوازه.* ـ گڤێر؛ ـ هەڵتاو؛ ـ دەن؛ هەرس کردنی ‹خوشگوار: خۆشگڤیر›.

**گوارا / govārā, gavārā/:** *صفت.* گوارا؛ ڕەوان؛ بێ گیر؛ نۆش: ۱. باش بۆ هەڵتاوان ۲. *[مجازی]* دڵخواز؛ خۆش.

**گوارایی / govārāyî/:** *اسم.* گوارایی؛ دۆخ یان چۆنیەتی گوارا بوون.

**گواردن / govārdan/:** *مصدر. متعدی.* // **گواردی:** هەڵتاواند؛ **مـی گـواری:** هەڵدەتاوێنی؛ **بگـوار:** هەڵتاوێنە // هەڵتاواندن؛ هەڵتاوین؛ دەناندن؛ گڤێرین؛ گڤیراندن؛ بگاردن؛ خێوراندن؛ هەزم کردن: **گواریدن.** هەروەها: **گواردنی**

■ صفت فاعلی: **گوارنده** (هەڵتاوێنەر)/ صفت مفعولی: **گوارده** (هەڵتاوێنراو)/ مصدر منفی: **نگواردن** (هەڵنەتاواندن)

**گوارش / govāreš/:** *اسم.* هەرسەک؛ دەن؛ کار و ڕەوتی شی بوونەوە و هەڵتاوینی خۆراک لە لەشدا.

**گوارشی / govārešî/:** *صفت.* هەرسەکی؛ دەنی ‹بیماری گوارشی: نەخۆشی هەرسەکی›.

**گواریدن / govārîdan/** ☜ **گواردن**

**گواش / guvāš, govāš/:** [فرانسوی]/*اسم.* گواش: ۱. ڕەنگدانەی نیگارکێشی کە لە ئاودا دەتوێتەوە بەڵام ئەگەر وشکەوە بوو بەرگەی شۆردن دەگرێ ۲. نەخشێک کە بە گواش کێشرابێت.

**گـواه / govāh, gavāh/، ـان/:** *اسم.* شایەت؛ شایەد؛ شاهێد؛ شادە؛ گەوا؛ گوا؛ گەواهـ ؛ گەڤا؛ گۆڤاه ؛ گۆڤا؛ گۆڤان؛ ئاگا؛ هاگا.

⊡ گواه آوردن: شایەت هێنانەوە/ هاوردن؛ گەوا هـانین/ هاوردنـەوە؛ کـەس یـان شـتێک بـۆ سەلماندنی قسەی خـۆ هێنانـەوە ‹برادرش را گواه آورد کە آن شب بـا او بـودە: براکـەی شـایەت هێناوە کە ئەو شەوە لەگەڵ ئەو بووە›.

گواه بودن: گـەوا بـوون؛ شـایەت بـوون؛ بـە چاوی خۆ دیتن ‹او خود گواه بـود کـە مـن پشـت فرمان ننشستە بودم: ئەو بۆ خۆی کەوا بوو کـە مـن لە پشت فەرمانەوە نەبووم›.

گواه گـرفتن: کردنـە شـایەت؛ گـەوا گـرتن؛ شـایەتگـرتن ‹دروغ مـی گفت و مـرا هـم گـواه مـی‌گرفـت: درۆی دەکـرد و منیشـی دەکـردە شایەت›.

**گواهی / govāhî, gavāhî/، ـها/:** *اسم.* شـایەتی؛ شایەدی؛ شادە؛ شەهادە؛ گەواهی؛ گۆڤانی؛ ستو؛ ستووڤ؛ گوزارشی نووسراو یان زارەکی لە سـەر ڕووداوێک ‹گواهی پُلیس: شایەتی پولیس›.

⊡ گـواهی دادن: شـایەتی دان؛ شـایەدی دان؛ شاهێدی دان؛ شادە دان؛ شێدێ دەی؛ هەواڵ دان لە ڕووداوێک ‹همسایەها گواهی دادنـد کـە او آن شب در خانە بودە است: هاوسێکان شـایەتیان دا ئەو شەوە لە ماڵ بووە›.

گـواهی شـدن: شـایەتی دران؛ ڕاگەیـنـدرانی زانیارییەک وەکـوو شـایەتی ‹گـواهی مـی‌شـود نامبردە از سـلامت کامـل برخـوردار اسـت: شـایەتی دەدری لەش‌ساغی ناوبراو تەواوە›.

گواهی گرفتن: شایەتی/ گـەواهی وەرگـرتن؛ گـەواهی هێنـان؛ وەرگـرتنی گوزارشـێک لـە شایەت ‹از دکتر گواهی گرفتم کە مریض بـودم: لـە دوکتور شایەتیم وەرگرت کە نەخۆش بووم›.

**گواهینامە / govāhînāme, gavāhî-/، ـها/:** *اسم.* بڕوانامە؛ گەواییـنامە؛ بەڵگەی ڕەسمی گوزارشـی ڕووداوێک لەمەڕ کەسێکەوە ‹گواهینامەی تحصیلی: بڕوانامەی خوێندەواری›.

**گوئی / gû'î/** ☜ **گویی**

**گوبلن / gûblan/، ـها/:** [فرانسـوی]/*اسم.* گوبلـەن؛ کۆپلەن: ۱. چنراوێکـی نەخشـینی دەسـتی بـۆ سـەر دیـوار یـان پـەردە ۲. تابلۆیـەکی جـوانی

دیواری کە نەخشەکانی بە دەرزی و دەزووی ڕەنگامە چنراوەتەوە.

**گوتیک** / gotîk /: [فرانسوی]/اسم. گوتیک؛ شێوەیەکی بیناسازی لە ئورووپای ڕۆژئاوا لە سەدەی ۱۲ تا ۱٦ی زایینیدا.

**گوجە** / gowce, go:ce ، ـهـا/: [ترکی]/اسم. هەڵووژە؛ هەڵووچە؛ هەڵووچکە؛ هەڵووجە؛ حەلووچکە؛ هەڵویچکە؛ حەلووکە؛ ئاڵووچە؛ ئەلووکە؛ هێرووگە؛ گەلاز؛ گلاز؛ گەلاس؛ مشمش: ۱. دارە سەمەرێکی چەند ساڵەیە، سەرەتای بەهار شکۆفە دەکاتەوە ۲. مێوە و بەری ئەو دارە ۳. تەماتە؛ تۆماتێز.

**گوجەای**[1] / gowce'î, go:ce'î /: [ترکی/ فارسی] /اسم. تەماتەیی؛ خوێنی؛ ڕەنگی سووری ماتی مەیلەو نارنجی.

**گوجەای**[2]: صفت. تەماتەیی؛ خوێنی؛ بە ڕەنگی تەماتەی گەیشتوو.

**گوجەسبز** / gowcesabz, go:ce- ، ـهـا/: [ترکی/ فارسی]/اسم. هەڵووژە؛ هەڵووچە؛ هەڵووجە؛ گەوجە؛ عەلووکەی بەهارە؛ مێوەی نەگەییوی هەڵووژە کە سەوز و ترشە.

**گوجەفرنگی** / gowcefarangî, go:ce- ، ـهـا/: [ترکی/ از فرانسوی]/اسم. تەماتە؛ تەمەتە؛ تەماتێ؛ تۆماتێز؛ باینجان؛ باینجانە سوورە؛ باژانا سۆر؛ باجاناسوور؛ باجاناسۆر؛ بایجانی سوور؛ باینجان فەرەنگی: ۱. گیایەکی ئالیکی بە گەڵای برگە ـ برگە و گوڵی تاکی مەیلەو سەوز ۲. بەری خڕ، سوور، گۆشتن و چاوە ـ چاوەی ئەو گیایە کە خواردنێکی زۆر باوە.

**گود**[1] / gowd, go:d ، ـهـا/:/اسم. چاڵ؛ قووڵایی؛ چاڵایی: ۱. زەوینێ کە بە هۆی هەڵکۆڵین و خاک هەڵگرتنەوە، نزمتر لە دەور و بەری خۆیەتی ۲. شوێنی وا کە سەرپەنایان لێ دروستکردووە ۳. قوڵکایی نێو زۆرخانە کە وەرزشی تێدا دەکەن.

**گود**[2]: صفت. قووڵ؛ قویل؛ نووق؛ نق؛ گاود؛ باهوو؛ ساکوڵ؛ سووتار؛ سووتاڵ؛ کاس: ۱. بە قووڵایی زۆرەوە ‹چاه گود: بیری قووڵ› ۲. بە تەختێکی نزمتر و خوارتر لە دەور و بەری خۆی ‹ظرف گود: دەفری قووڵ›.

▣ **گود افتادن**: چاڵ کەوتن/ کەفتن ‹قسمتی از باغچه گود افتاده بود: بەشێک لە باخچەکە چاڵ کەوتبوو›.

**گود شدن**: قووڵ بوونەوە؛ چاڵ بوون ‹رودخانه کمی پایین‌تر گود می‌شود: ڕووبارەکە هێندێک خوارتر قووڵ دەبێتەوە›.

**گود کردن**: قووڵ/ قووڵ کردنەوە؛ چاڵ کردن؛ کووراندن؛ کەندن تا قووڵ دەبێ ‹باغچه را گود کرد تفنگ را گذاشت توی آن: باخچەکەی قووڵ کردەوە و تفەنگەکەی تێناشت›.

**گودال** / gowdāl, go:dāl ، ـهـا/:/اسم. چاڵ؛ چاڵی؛ قووتە؛ قووڵکە ‹یک گودال کندیم و کتاب‌ها را گذاشتیم توی آن: چاڵێکمان کەند و کتێبەکانمان تێنا›: مُغاک

**گودبای‌پارتی** / gudbāypārtî ، ـهـا/: [انگلیسی] /اسم. میوانی مالاوایی؛ جێژنێ کە بۆ بەڕێ کردن و خوداحافیزی لە کەسێ ڕێ دەخرێت.

**گودبرداری** / gowdbardārî, go:d- ، ـهـا/:/اسم. پەی‌کەنی؛ بنکۆڵی؛ کار و ڕەوتی بنەڕەت دانەوە ‹خانه‌ای بر اثر گودبرداری از زمین مجاور، فروریخت: ماڵێک بە بۆنەی پەی‌کەنی زەویەکەی تەنیشتی، ڕووخا›.

**گودنشین** / gowdnešîn, go:d- ، ـهـا؛ ـان/: صفت. دانیشتووی شوێنی نزم و چاڵ.

**گوده** / gowde, go:de /:/اسم. [خیاطی] کەلەوش؛ چەشنێک برینی کەوانەیی لە جل دووریندا بۆ هەراوکردنی جل‌وبەرگ (وەک ئاتەگی داوێن).

**گودی** / gowdî, go:dî /:/اسم. قووڵایی؛ قووڵی؛ قووڵکایی؛ قووڵک؛ چاڵی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی قووڵ بوون ‹گودی حوض خوب است، اما اندازه‌اش

کوچک است: قوولایی حەوزەکە باشە، بەلام بچووکە›
٢. چاڵ؛ شوێنی قووڵ ‹گودی چانه: قووڵکایی چەناگە›.

**گور** / gûr ، ـها/:اسم. گۆڕ؛ گڵکۆ؛ قەبر؛ قەبرە؛ قەور؛ گۆڕخانە؛ تا؛ گۆڕن؛ دەخمە؛ چاڵی تێناشتنی مردوو.

▣ **گور به گور شدن** ☜ **گوربگور**

**گور خود را کندن**: *[کنایی]* ملی خۆ کردنە پەتەوە؛ خۆ دانە دەم گورگەوە؛ قەبری خۆ کەندن؛ خۆ خستنە بەر مەترسی مردنەوە ‹با این کار گور خودت را می‌کنی: بەم کارە ملی خوت ئەکەیتە پەتەوە›.

**گور (خود) را گم کردن**: *[مجازی]* مل(ی خۆ) شکاندن؛ گۆڕ(ی خۆ) گوم‌کردن؛ ملوو (وێ) مارتەی؛ ڕۆیشتن و ون بوونی کەسێکی خراپ یان دوژمنێک ‹از این‌جا گورش را گم کرد و رفت: ملی شکاند و لێرە ڕۆی›.

**از گور برخاستن/ بلند شدن**: *[کنایی]* لە قەبر دەرهاتن؛ دەم بۆ گیلاخە خواردن چوون؛ نەخۆش و حاڵ‌شڕ بوون ‹بەقدری بیمار بود، انگار الآن از گور برخاسته باشد: هێندە نەخۆش بوو، دەتگوت هەر ئێستا لە قەبر دەرهاتووە›.

**گوراسب** / gûr(e)'asb ، ـها؛ ـان/:اسم. گۆڕ؛ شەمامە؛ ئەسپە شەمامە؛ گواندارى ئاڵفخۆری ئەفریقایی بە پێستی خێڕ ـ خێڕی سپی و ڕەشەوە: زِبرا

**گوربگور** / gûrbegûr :/صفت. گۆڕبەگۆڕ؛ گۆڕوەگۆڕ؛ گۆڕەوگۆڕ؛ تووشیاری گۆڕ بە گۆڕی.

▣ **گوربگور شدن**: گۆڕبەگۆڕ/ گۆڕوەگۆڕ بوون؛ گۆڕاوگۆڕ بوون؛ لە گۆڕێک دەرهاتن و کەوتنە گۆڕێکی‌تر (جۆرێ جنێوە). هەروەها: **گوربگور کردن**

**گوربگوری** / gûrbegûrî :/اسم. گۆڕبەگۆڕی؛ گۆڕەوگۆڕی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لە گۆڕێکەوە دەرهاتن و کەوتنە گۆڕێکی‌تر.

**گورخر** / gûr(e)xar ، ـها؛ ـان/:اسم. گۆڕ؛ خەرگۆڕ؛ کەرکێوی؛ خەرگۆلک؛ کەرەکولان؛ کەرەکێفی؛ کەرکووڤی؛ گۆڕەکەر؛ هەرەشەمامە؛ کەرە کێویلەی ئاسیایی بە گوێی قوڵ، کلکی درێژ و تەنک و یاڵی کوڵ و زبرەوە.

**گورستان** / gûrestān ، ـها/:اسم. سەرقەبران؛ قەورسان؛ قەبرسان؛ قەبران؛ قەوران؛ قەبرستان؛ زیارەتان؛ سەرزیارەتان؛ زیارەتەلان؛ زیارەتلان؛ گۆڕستان؛ گۆڕسان؛ گۆڕخانە؛ مەرغ؛ مەغریبسان؛ مەغریوسان: ١. شوێنێ کە خەڵکی شار یان گوند مردووەکانیان لێ‌دەنێژن ‹گورستان شهر: سەرقەبرانی شار› ٢. شوێنێ کە ژمارێکی زۆری گیانداری تێدا مردبێ ‹گورستان فیل‌ها: گۆرستانی فیل› ٣. *[کنایی]* شوێنی قەلاچۆکرانی خەڵک ‹آن شهر گورستان دشمن شد: ئەو شارە بووە گۆڕستانی دژمن›.

**گورکن** / gûrkan ، ـها/:اسم. ١. /ـان/ قەبرکەن؛ قەورکەن؛ قەبرەلقەن؛ قەبرەلکەن؛ قەبرهەلقەن؛ گۆڕهەڵکەن؛ گۆڕکوڵ؛ گۆڕکەن؛ ئەوەی گۆڕ بۆ مردوو هەڵدەقەنێ ‹گورکن قبر را کنده بود: قەبرکەن گۆڕەکەی هەڵکەندبوو› ٢. کوڕەبەش؛ کوڕەبەشک؛ کوڕەبەشەک؛ کوربەشک؛ چوالو؛ چالو؛ چوالوو؛ چوارلۆ؛ چالگ؛ چالک؛ چالە؛ چارکە؛ قورەبەشە؛ تژی؛ چالەکە؛ گۆڕەوکەنە؛ گۆڕکەنک؛ گۆڕپشکنەک؛ قەورپشکنەک؛ گۆڕهەڵکەنە؛ قەورکەنە؛ گۆڕنەباش؛ بەتکریەش؛ بەتکەبەش؛ وشەک؛ گیانەوەری گواندارى شەوگەڕ بە لەشێکی پان و پۆڕ و قورس، قەپۆزی باریک، چنگ و پەلی تیژ و تیسکی درێژی خۆڵەمێشیەوە کە لە مووەکەی بۆ دروست‌کردنی فلچە کەڵک وەردەگرن.

**گورگیاه** / gûrgiyāh ، ـها/:اسم. جۆداس؛ جویدار؛ پەلەسوور؛ پەلەسوورە؛ سفۆن؛ گیای نێو زەلکاوان، تایبەتی ناوچەی گەرمێن، بە لاسکی بۆنخۆش و گوڵی هێشووییەوە کە بۆ ئاڵف

دەبێ.

**گوریـــدن / gûrîdan/:** *مصـــدر. لازم. [گفتـــاری]* ۱. ژاکـــان؛ ژاکیـــان؛ سیســـیان؛ چرمســـین؛ پەژمـــەرین ۲. شلـــەژان؛ شلـــەژیان؛ شـــێویان؛ ئاڵۆزان؛ هەربلین؛ تێکچوون؛ شیویەی؛ هەبلین.

■ صفت مفعولی: **گوریده** (ژاکاو/ شلەژاو)

**گوریده / gûrîde/:** *صفت.* ۱. ژاکـاو؛ پەژمـەراو؛ چەرمسیو؛ سیسیاگ ۲. شلەژاو؛ شپرز؛ ئاڵـۆزاو؛ تێکچوو؛ شێویاگ.

**گوریـل / gûrîl** ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* گوریـل؛ گووریل؛ گیانەوەری گوانداری گیاخۆر، بە لەشی قورس و پێست و مووی ڕەش و بـۆرەوە کـە لـە سـەر لـەپی پـێ و بـە یارمـەتی قامکـەکانی دەستیەوە، کۆمەکۆم دەڕوا.

**گوز / gûz/:** *اسم. [مستهجن]* زڕ؛ تڕ؛ تڕتاڕ؛ ڤینگ؛ گیز؛ بای نێو سک کە بە دەنگەوە لە قـوون فـت بێ.

⊡ بە گوز ـ گوز افتادن: کەوتنـە تـڕە ـ تـڕەوە؛ کەفتنە تڕەتڕ: ۱. *[گفتاری]* لە سـەر یـەک تـڕ دانەوە؛ پەسایپەس تڕین ۲. *[تعـریض]* تـوان و لێهاتوویی خۆ لە دەست دان.

گوز آخر را دادن: *[تعریض]* سل سارد بوونەوە؛ لاق جووت‌کردن؛ سلێ جۆت بیەی؛ مردن.

گوز بە شقیقە چەکاری/ ربطی دارد؟: لە هەمزە چـی داوە هـەواس؟؛ هـەمزە بـە هەواسـیەوە چی؟ تڕ بە تەوەرداسـیەوە چـی؟؛ دارەکـەی سەرکەل و پردەکەی قشلاخ.

گوز پیچ شدن: *[تعریض]* ۱. تڕ لە قنگ گیران؛ تـڕ پـێچ خـواردن؛ تووشـی نەخۆشـی یـان ئازارێکی سووک بوون ۲. سەر لێ شێوان؛ گێژ بوون.

گوز دادن: تڕ لێدان؛ تڕ دانەوە؛ تڕکەندن؛ تـڕ کەنتەی؛ تڕین.

**گـوزن / gavazn** ، ـها/: *اسم.* ئـافور؛ گـاکێوی؛ گـــەوەزن؛ گەوەزنـــە؛ گەڤـــەزن؛ کەڵـــەکێوی؛ گاکۆڤی؛ گاکووڤی؛ گـاکێفی؛ ژڤـر؛ شڤـر؛ گـای کوویەی؛ گیانەوەری گواندار و ئاڵفخۆری کێـوی جووت‌سم کە کاوێژ دەکـا و نێرەکـەی جووتـێ شاخی بەرزی هەیە، هـەموو ساڵـێ دەکـەوێ و دەردێتەوە.

**گوزو / gûzû** ، ـها/: *صفت. [گفتاری، مستهجن]* تڕن؛ تڕکەن؛ تڕین؛ تڕکەر؛ تڕۆل؛ تڕنە.

**گوزیـدن / gûzîdan/:** *مصـدر. لازم. [مسـتهجن]* // **گوزیدی:** تـڕای؛ **می گـوزی:** دەتـڕی؛ **بگـوز:** بتـڕە// تڕان؛ تڕین؛ تـڕەی؛ تـڕای؛ تـڕ دان؛ تـڕ دانـەوە؛ تڕکەندن؛ تڕکەنتەی؛ تڕ لێدان؛ بەردانەوەی بای زگ بە دەنگەوە.

■ صـفت مفعـولی: **گوزیـده** (تـڕاو)/ مصـدر منفـی: **نگوزیدن** (نەتڕان)

**گوژپشت / gûjpošt/** ☜ **کوژپشت**

**گوساله / gûsāle** ، ـها/: *اسم.* گوێرەکە؛ گوێرەکـە؛ گۆرەکـە؛ گۆلەکـە؛ گـوێرک؛ گوێـل؛ گوێلـک؛ گۆلک؛ گێلک؛ گوێلپار؛ گۆوەر؛ گۆرەکلە؛ کوێـل؛ حۆلی؛ گۆر؛ گۆرە؛ گوێر؛ گوور؛ گوورە؛ پارگوێـل؛ گۆک؛ گۆل؛ گوساڵ؛ گۆسـالە؛ پـارگوێر؛ پارێنـە؛ پارێن؛ پارین؛ نیەون؛ گچە؛ سەنگۆ؛ پانێر؛ بەچکە چێلی نەگووراو.

**گوسفند / gûsfand/:** *اسم.* ۱. مـەڕ؛ پـەز؛ پێـز؛ پەس؛ پەزمامێ؛ مێ؛ شەک‌مەڕ؛ میەر؛ مـەڕەزاو؛ مەڕزاو؛ مەهـ؛ مێهـ؛ میهـ؛ مهـ؛ مـەها؛ مهـی؛ میهی؛ مەی؛ مەیشـنا؛ مینگا؛ مێشـن؛ مێشـنا؛ میک؛ مێیە؛ گەورگ؛ کوڕ؛ گیانەوەری گوانداری کاوێژکەر، لە دوو جۆری کێوی و کەوی کـە بـۆ شیر، گۆشت، کەوڵ و پەشمەکەی ڕایـدەگرن و دایدەبەســـتن ۲. پـــەژ؛ هەشـــتەمین ساڵـــی ساڵپێوی تورکستانی.

⊡ گوسفند نر: وەرهان؛ بەران؛ وەران؛ شەکەنێر.

**گوش / gûš** ، ـها/: *اسم.* گوێ؛ گوێچکە؛ گوێچک؛ گێچکە؛ گۆچک؛ گوە ؛ گۆهـ ؛ گـۆش ؛ گـووش؛ گـوەش؛ گـێ؛ گـۆ؛ گویـە؛ گۆیـە: ۱. ئەنـدامی

بیستن و ڕاگرتنی هاوسەنگی ٢. گوێی دەرەوەی مرۆڤ و زۆربەی گوانداران ٣. [مجازی] هەستی ژنەوایی ٤. [مجازی] ئەوەی بۆ شۆفاری گوێ دەگرێ ٥. گۆشە؛ چمک ‹چهار گوش: چوار گۆش›.

◙ **گوش تا گوش**: ئەمپەڕ تا ئەوپەڕ؛ پەڕاوپەڕ؛ لەمپەڕ تا ئەوپەڕ؛ گۆشاوگۆش؛ لەی گووش ڤەو گووش؛ ئی گۆش تا ئەو گۆش؛ لەم گوێ تا ئەو گوێ ‹گوش تا گوش نشستن: ئەمپەڕ تا ئەوپەڕ دانیشتن›.

**گوش دریا** ☜ **گوش‌دریا**

**گوش فیل** ☜ **گوش‌فیل**

**گوش موش** ☜ **گوش‌فیل**

◙ **گوش ایستادن**: [مجازی] گوێ هەڵخستن؛ کەلە/ کوڵ/ کردن؛ کوڵە گرتن؛ گوێقوڵاخ وەستان؛ خۆ داگرتن بۆ گوێگرتن لە قسەی خەڵک ‹پشت در گوش ایستاده بود: لە پشت درگاوە گوێ هەڵخستبوو›.

**گوش بریدن** ☜ **گوش‌بری**

**گوش به حرف کسی ندادن**: گوێ بە کەس نەدان؛ گوێ بە قسەی کەس نەدان ؛ گوێچکە نەلەقیان؛ بە قسەی کەس نەکردن ‹تو کار خودت را بکن و گوش به حرف کسی نده!: تۆ کاری خۆت بکە و گوێ بە کەس مەدە!›.

**گوش تیز کردن**: [مجازی] گوێقوڵاخ کردن ‹گوش تیز کرده بود بفهمد چه می‌گویند: گوێیقوڵاخ کردبوو بزانێ چی ئێژن›.

**گوش خواباندن**: [مجازی] خۆ ماتە دان: ١. خۆ داگرتن ‹گوش خواباندم ببینم کی می‌خوابند تا بتوانم از آنجا بیرون بیایم: خوم ماتە دابوو بزانم کەی دەخەون لەوێ بێمە دەرێ› ٢. مەلاز بردنەوە؛ مەلازگرتن؛ ملاز دان؛ ملاس‌گێرتەی؛ خۆ مەلاز دان ‹برای خانەی ما گوش خوابانده بود: مەلازی لە ماڵی ئێمە بردبووە›.

**گوش خود را باز کردن**: گوێ شل‌کردن؛ گوێ دان؛ گوێگرتن ‹خوب گوشت را باز کن ببین چە می‌گویم!: باش گوێ شل کە بزانە چی ئەڵێم!›.

**گوش دادن/ کردن**: گوێ دان؛ گوێ شل کردن؛ گوێچکە تەکاندن؛ گوێچکە دان: ١. گوێگرتن؛ گوێ ڕاگرتن؛ گووش داین ‹داشت به رادیو گوش می‌داد: خەریک بوو گوێ لە ڕادیۆ ڕادەکرت› ٢. بە گوێ‌کردن؛ بە قسەکردن ‹به حرفش گوش دادم و کتاب را خریدم: بە گوێم کرد و کتێبەکەم کڕی›.

**گوش فرا دادن**: [ادبی] گوێ هەڵخستن؛ گوێچکە شل‌کردن؛ گوێ دان بە قسە؛ گۆش دەی/ دای؛ گۆشەنە دارەی؛ گوێ ڕاگرتن بۆ بیستن.

**گوش کسی با کسی بودن**: گوێ لە کەسێ بوون؛ گوێ بۆ قسەی کەسێ شل‌کردن ‹گوشت با من است؟ بلی گوشم با شماست: گوێت لە منە؟ بەڵێ گوێم لێتانە›.

**گوش کسی بدهکار نبودن**: [مجازی] گوێی کەسێ شل نەبوون؛ بەگوێ نەکردن؛ گوێ نەدان؛ پایەی قسەی کەسێ نەبوون ‹هر چە گفتم، گوشش بدهکار نبود: هەر چێکم گوت گوێی شل نەبوو›.

**گوش کسی پر بودن**: [کنایی] گوێی کەسێ پڕ بوون؛ پێشتر قسەی وا بیستن ‹گوش من از این حرف‌ها پر است: گوێم لەم قسانە پڕە›.

**گوش کسی را بردن**: مێشکی سەری کەسێک بردن/ خواردن؛ گۆشوو یوێ وستەیرە؛ مۆخ کەسێ بردن/ خواردن ‹این قدر سر و صدا نکنید، گوشم را بردید: ئەوەندە گرم و قاڵ مەکەن، مێشکی سەرمتان خوارد›. هەروەها: **گوش کسی رفتن**

**گوش کسی را پر کردن**: [کنایی] بە گوێی کەسێکدا کردن/ خوێندن؛ کەسێ پڕکردنەوە ‹پیدا بود که حسابی گوش عروس خانم را پر کرده‌اند: دیار بوو باش بە گوێی بووکیاندا کردبوو›.

گوش کسی را کشیدن: *[کنایی]* گوێی کەسێ جەڕ دان/ کێشان؛ کەسێک تەمێ‌کردن ‹مدتی است خیلی شلوغ می‌کند باید گوشش را کشید: ماوەیەکە زۆر هار و هاجی دەکا دەبێ گوێی جەڕ ددین›.

گوش کسی سنگین بودن: گوێ کەسێ گران/ قورس بوون؛ گوێچکەی کەسێ سەنگین بوون ‹گوش من کمی سنگین است، لطفاً بلند صحبت کنید!: گویم تۆزێک گرانە، تکایە بەرز قسە بکەن!›.

به گوش رسیدن: هاتنە گوێ/ بەرگوێ؛ بیستران ‹صدای آوازی به گوش می‌رسد: دەنگی ئاوازێ دیتە گوێ›. هەروەها: **به گوش رساندن**

به گوش/ در گوش/ تو(ی) گوش کسی خواندن: *[کنایی]* بە کەسێ فاماندن؛ کەسێک هێنانە سەر باوەڕێک بە گوتنەوەی زۆر ‹به گوش او خواندم که اگر نیاید، ضرر می‌کند: پێم فاماند ئەگەر نەیەت، زەرەر دەکا›.

به گوش کسی خوردن: هاتنە بەرگوێی کەسێک؛ دان لە گوێی کەسێک؛ بە هەڵکەوت شتێک بیستن ‹صدای آشنایی به گوشم خورد: دەنگێکی ئاشنا هاتە بەرگوێم›.

به گوش کسی رساندن: گەیاندنە گوێی کەسێک: ١. بۆ کەسێ قسەکردنەوە؛ بۆ کەسێک گەڕاندنەوە ‹حرف‌های مرا به گوش پدرم رسانده بود: قسەکانمی گەیاندبوود گوێی باوکم› ٢. بە گوێی کەسێکدا دان/ هێنان/ هاوردن؛ کەسێک بە هێماوە ئاگادارکردن ‹به گوشش رسانده بودند که برادرش بیمار است: بە گوێیاندا دابوو براکەی نەخۆشە›.

به گوش کسی نرفتن: بە گوێی کەسێدا نەچوون؛ نەچوونە گوێچکەی کەسێکا؛ بە گوێ نەکردن ‹هرچه گفتم به گوشش نرفت: هەرچێکم گوت بە گوێیدا نەچوو›.

به گوش گرفتن: گرتنە گوێ؛ بیستن و لە بەر کردن ‹آنچه را گفتم به گوش بگیر: ئەوەی گوتم بیگرە گوێ›.

پشت گوش انداختن: *[گفتاری]* ١. داخستن؛ کارێک خستنە دواوە ‹یک سال بیشتر است که این کار را پشت گوش انداخته: ساڵێک پترە ئەم کارەی داخستووە› ٢. گوێ شل نەبوون؛ بایەخ نەدان؛ بێ‌مبالات بوون ‹این آقا که من می‌شناسم، حرف خدا و پیغمبر را هم پشت گوش انداخته: ئەم کابرایە وەک ئەیناسم، گوێی بۆ قسەی خودا و پەیغەمبەریش شل نیە›.

**گوش‌آزار** / gûšāzār, -'āzār/: *صفت.* بە دەنگی بەرز و ناخۆشەوە.

**گوشبری** / gûšborî، ـها/: *اسم.* دەسبڕی؛ دەزبڕی؛ گوێ‌بڕی؛ گۆشبڕی؛ کاری سەندنی پارە و ماڵ بە فێڵ و گت لە خەڵکی. هەروەها: **گوشبر**

**گوش‌بل** / gûšbal، ـها/: [فارسی/ کردی] *صفت.* گوێ‌بەل؛ گۆبەل؛ گوهبەل؛ گوێچکەقوت؛ خاوەن گوێی پان و زۆپ.

**گوش‌به‌زنگ** / gûšbezang/: *صفت.* وازر؛ وازڕ؛ گوێ‌قولاخ؛ گوێ‌قولاغ؛ گووشەقولاخ؛ لەسەرهەست: ١. ئامادەی بیستن ‹گوش‌به‌زنگ تلفن بودم: وازری تەلەفوون بووم› ٢. وریا و ئامادە لە باری زەینیەوە ‹گوش‌به‌زنگ باش! اگر آمد خبرم کن!: لەسەرهەست بە! ئەگەر هات ئاگادارم کە!›.

**گوش‌پاک‌کن** / gûšpāk.kon، ـها/: *اسم.* گوێ پاکەوکەر؛ چوکڵەیەکی سەرلۆکەیی بۆ خاوێن کردنەوەی ناو گوێ.

**گوشت** / gûšt/: *اسم.* گۆشت؛ گووشت؛ گۆست؛ گۆژد: ١. نەرمایی لەشی گیانداران، بەتایبەت مۆرەغەداران، بریتی لە ماسوولکەی دەوری ئێسک ٢. بەشی نەرمی لەشی گیاندارانی حەلاڵ کە دەخورێ (وەک گۆشتی گا، ماسی، مریشک، پەز و...) ٣. *[مجازی]* بەشی ناوەوەی میوە کە ئاودارە.

◙ **گوشت دم‌توپ:** *[کنایی]* سینەی بەر گوللە؛ ئەوەی لە شەڕدا بە کوشت دەدرێت ‹چرا جوانهایمان گوشت دم توپ بشوند؟: بۆچی لاوەکانمان سینەی بەر گوللە بن؟›.

**گوشت راستە** ☜ **راستە**[1]ـ**١**

**گوشت سفید:** گۆشتی سپی/ چەرمگ؛ گۆشتی پەلەوەر و ماسی.

**گوشت قرمز:** گۆشتی سوور؛ گۆشتی ئاژەڵ و مالات.

**گوشت کوبیدە** ☜ **گوشت‌کوبیدە**

◙ **گوشت آوردن:** *[مجازی]* گۆشت گرتن؛ چاخ/ قەڵەو/ خڕ بوونەوە؛ گۆژدگێرتەی ‹وقتی او را دیدم حسابی گوشت آوردە بود: کاتێ دیتم تەواو گۆشتی گرتبوو›.

**گوشتالو** / gûštālû ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* گۆشتن؛ قەڵەو؛ پڕگۆشت ‹صورتی گوشتالو داشت: سەر و سیمایەکی گۆشتنی هەبوو›.

**گوشت‌تلخ** / gûš(t).talx ، ـها/: *صفت. [مجازی]* گۆشتاڵ؛ ناوچاوتاڵ؛ ئێسک‌قورس؛ ئێسک‌گران؛ ڕەزاگران. هەروەها: **گوشت‌تلخی**

**گوشتخوار** / gûštxār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* گۆشتخۆر؛ گۆژدوەر: ١. فێرە گۆشت؛ هۆگرتووی گۆشت خواردن ٢. بە تایبەتمەندی خواردنی گیانەوەرانەوە ‹گیاه گوشتخوار: ڕوەکی گۆشتخۆر›.

**گوشتخواری** / gûštxārî/: *اسم.* گۆشتخۆری؛ گۆژدوەری: ١. کار و ڕەوتی دابین‌کردنی بژیو لە گۆشت ٢. تایبەتمەندی ئەو گیایانەی لە جڕ و جانەوەر دەخۆن.

**گوشتدار** / gûštdār/: *صفت.* گۆشتن؛ گۆشتین: ١. گۆشتی؛ بە گۆشتەوە ٢. بە ڕواڵەتێکی پڕگۆشت.

**گوشتکوب** / gûštkûb ، ـها/: *اسم.* گۆشتکوت؛ گۆشکوت؛ گۆژدەوەکۆ؛ کوتکی گۆشت کوتان.

**گوشت‌کوبیدە** / gûštkûbîde/: *اسم.* گۆشت‌کوتیاگ؛ خۆراکی گۆشت، سێفەزەمینە، پیواز و دانەوێڵەی ئاوگۆشت کە باش دەیانکوتن و تێکەڵیان دەکەن.

**گوشتی** / gûštî/: *صفت.* گۆشتی؛ گۆژدی: ١. لە گۆشت؛ بە گۆشت لێنراو ‹خوراک گوشتی: خۆراکی گوشتی› ٢. بۆ گۆشت ‹گوسفند گوشتی: مەڕی گوشتی›.

**گوشخراش** / gûšxarāš/: *صفت.* گوێدڕ؛ ئازاردەری گوێ. بەرانبەر: **گوشنواز**

**گوشخیزک** / gûšxîzak ، ـها/: *اسم.* دووکلکە؛ کوزەبڕکە؛ گوسەبڕکە؛ گۆشەبڕکە؛ سۆلسۆلە؛ میروویەکی قالۆچەئاسای درێژووکەیە بە دوو جووت باڵی لە بەر و دواوە کە باڵی پێشوو کورت و ئەوی پاشی پانە.

**گوش‌درد** / gûšdard/ ☜ **درد**[2]

**گوش‌دریا** / gûšedaryā ، ـها/: *اسم.* گوێچکەماسی؛ گوش‌ماساو: ١. جانەوەرێکی لەش‌نەرمی قاپێلکدارە ٢. گوێ‌ماسیلە؛ گوێ‌ماسیلکە؛ لەپکەی ئەو جانەوەرە کە کاتێ بە گوێوە دەنرێ، دەنگی دەریای لێوە دێ.

**گوشزد** / gûšzad/: *اسم.* وەبیرخراو.

◙ **گوشزد شدن:** وەبیرهێنانەوە؛ وەبیرخرانەوە. هەروەها: **گوشزد کردن**

**گوش‌فیل** / gûš(e)fîl ، ـها: [فارسی/ معرب]/*اسم.* گوێفیل؛ گۆفیل؛ گوش‌فیل؛ گوێچکەفیلێ؛ گوش‌پیل: ١. جۆرێک شیرینی لە ئارد، شیر، ڕۆن و زەردێنەی هێلکە کە وەک گوێی فیل پانی دەکەنەوە و لە ڕۆنی قرچاوی دەخەن وئەنجا لە شەربەتی دەگەوزێن ٢. گیایەکی خواردنی بە گەڵای درێژ و پانی وەک گوێی فیل و گوڵی بۆنخۆش و ڕیشەی گۆشتنەوە: **فیلگوش**

**گوشک** / gûšak/: *اسم. [پزشکی]* گوێڕەپە؛ گوێ‌ڕەپانە؛ ملەخڕێ؛ ئوریۆن؛ ئاوسانی لووی لیکی ژێر گوێ.

**گوشگیر** / gûšgîr ، ـها/: *اسم.* گوێ‌بەن؛ گوێخن: ١. دەنگ‌بڕ؛ کەرەستەیەک بۆ گرتنی گوێ،

دەنگی پێنەگا ۲. کەرەستەیەک بۆ داپۆشانی گوێ ئاوی تێنەچێ.

**گوشمال** / gûšmāl/ ☜ **گوشمالی**

**گوشمالی** / gûšmālî ، ـها/:/اسم. تەمێ؛ تۆپان‌تر؛ کاری سزادانی کەسێ: **گوشمال**

▣ **گوشمالی دادن**: تەمێ‌کردن؛ تۆپانترکەردەی؛ تاشان؛ کوتان؛ سزادان؛ ئەدەب‌کردن ‹باید این دانش‌آموزان بازیگوش را حسابی گوشمالی داد: دەبێ ئەم قوتابیە هار و هاجانە باش‌ـ باش تەمێ بکرین›.

**گوش‌ماهی** / gûšmāhî ، ـها/:/اسم. لەپکە؛ گوێ‌ماسیلکە؛ گوێچکەماسی؛ گوهماسی؛ گۆش‌ماساو؛ گووشەلوو؛ قاپێلکی برێ گیانداری لەش‌نەرمی دەریایە کە لە داکشەی ئاودا، لە قەراخ چۆم و زەریاوە بە جێ دەمێنن.

**گوش‌موش** / gûš(e)mûš ، ـها/:/اسم. گۆشەملە؛ بنەگیایەکی یەک‌سالە لە تیرەی گەزنە بە ڕیشووی ناسک، لقی نەرم و گەڵای باریکی وەک گوێی مشکەوە.

**گوشنواز** / gûšnavāz/: صفت. بلاوێن؛ گوێ‌لاوێن؛ هۆی چێژ و حەواندنەوەی گوێ ‹صدایش آرام و گوشنواز بود: دەنگی نەرم و بلاوین بوو›. بەرانبەر: **گوشخراش**

**گوشوار** / gûšvār/ ☜ **گوشواره‌ـ۲**

**گوشوارک** / gûšvārak ،ـها/:/اسم. ۱. [گیاه‌شناسی] قنچکی گەڵا؛ زیپکە چکۆلەی بن‌گەڵا لە سەر لقەوە کە چرۆی تازە دەرهاتوو دەپارێزێ ۲. ☜ **شمشیر‌ـ۲**

**گوشواره** / gûšvāre ، ـها/:/اسم. ۱. گوارە؛ گۆشوارە؛ گۆشەوارە؛ گوێشوارە؛ گۆشیار؛ گوارکە؛ گووشخار؛ گووشخارە؛ گووشپارە؛ گوهار؛ گوهارک؛ گهار؛ گار؛ شۆڕاوە؛ خشڵێ کە دە گوێ دەکرێ ۲. [معماری] گوێسوانە؛ ژێرتاق؛ ڕزنێک ئاجۆری سەر دیوار لە بن میچ یا بە دەوری دەرکەوە: **گوشوار** ۳. دیوێک لە سەر یان پەنای تەلارەوە کە زۆرتر دەرک یان دەلاقەیەکی بۆ ناو تەلارەکە هەیە.

**گوشه** / gûše ، ـها/:/اسم. ۱. سووچ؛ سیلە؛ قوڕنە؛ قوژبن؛ کوژبن؛ کووژی؛ گەڤەر؛ گوێچک؛ قونج؛ کونج؛ کونجول؛ کونجور؛ قورنەت؛ قۆرزی؛ قولینچک؛ قوولینج؛ گووچ؛ قورچ؛ چوکلە؛ کونجوڕ؛ کونجوول؛ گۆشە؛ موور؛ چمک؛ پەنا؛ تیل؛ کۆخار؛ کاژێر؛ کانک؛ چمک؛ چمگ؛ هۆک؛ کۆچە؛ کوویژرک؛ کونچک؛ شوێنی پێک گەیشتنی دوو دیوار ‹گوشه‌ی اتاق: سووچی دیو› ۲. قەیار؛ قەراغ؛ قەراخ؛ قوژبن؛ کوژبن؛ کووژی؛ گەڤەر؛ قونج؛ کونج؛ قورچ؛ گۆشە؛ کەنار؛ نچ؛ پەنا؛ تیلا؛ تیلە؛ چمک؛ مک ‹در یک گوشه‌ی شهر: لە قەراخێکی شاردا› ۳. [مجازی] قونج؛ کونج؛ قورچ؛ چوکلە؛ گۆشە؛ سووچ؛ تیل؛ تیلا؛ تیلە؛ کوویژرک؛ چمک؛ شوێنی مەند و بێ‌دەنگ ‹رفت در یک گوشه پنهان شد: چوو لە کونجێکدا خۆی شاردەوە› ٤. [مجازی] تەشەر؛ تانە؛ توانج ‹در میان حرف‌هایش گوشه‌ای هم به من زد: لە ناو قسەکانیدا تەشەرێکیشی لە من دا› ۵. گۆشە؛ لە بەشەکانی دەزگای موسیقای ئێرانی.

▣ **گوشه‌ی چشمی به کسی داشتن**: [کنایی] بەر بە لای کەسێکەوە کردن؛ تا ڕادەیەک لە بیری کەسێکدا بوون و پێ چاکەکردن ‹جناب وزیر گاهی گوشه‌ی چشمی به ما داشت: جەنابی وەزیر جار‌ـجار بەری بە لای ئێمەوە دەکرد›.

**گوشه زدن**: [مجازی] تانە/ تەشەر لێدان؛ مەتەڵەک وتن؛ قسەی بە تێکوڵ کردن ‹چرا گوشه می‌زنی؟ حرفت را صریح بگو!: بۆ تانە لێ‌دەدەی؟ قسەکەت ڕووت و ڕاست بێژە!›.

**گوشه گرفتن** ☜ **گوشه‌گیری**

**از گوشه‌ی نانش کسی نشکستن**: [کنایی] مریشکی کویریش نان لە ماڵی دەرنەکردن؛ کەس نانی مێلاک/ چەشکە نەکردن؛ زۆر ڕژد و دەس‌قووچاو بوون.

**از گوشه‌ی چیزی زدن:** *[مجازی]* لە شتێک گرتنەوە؛ لە شتێک دزینەوە/ خستنە لاوە ‹از گوشه‌ی خرج خانه زدم و پس‌انداز کردم: لە خەرجی مالم گرتەوە و پاشەکەوتم کرد›.

**گوشه‌ای** [1] / gûše'î /: *صفت.* گۆشەیی؛ بن سووچی؛ لە گۆشە؛ لە سووچ و کونج ‹دکان گوشه‌ای: دووکانی گۆشەیی›.

**گوشه‌ای** [2] /ـها/: ضمیر. گۆشەیی؛ کەس یان شتی لە بن سووچ ‹گوشه‌ای را بردار!: گۆشەییەکە هەلگرە!›.

**گوشه‌کنار** / gûšekenār / ☜ **گوشه و کنار**

**گوشه‌کنایه** / gûšekenāye / [فارسی/ عربی] ☜ **گوشه و کنایه**

**گوشه‌گیر** / gûšegîr ، ـان/: *صفت. [کنایی]* دوورەپەرێز؛ دوورەوپەرێز؛ کونجنشین؛ دوورەخەلک؛ دەرکەنار؛ واردەس؛ گۆشەگیر؛ هۆگرتوو بە تەنیایی و خۆ لە خەلک پارێزی.

**گوشه‌گیری** / gûšegîrî ، ـها/: *اسم. [کنایی]* دوورەپەرێزی؛ دوورەوپەرێزی؛ گۆشەگیری؛ کونجنشینی؛ ڕەوتی تەنیایی هەلبژاردن و خۆ لە خەلک پاراستن.

**گوشه‌نشین** / gûšenešîn /: *صفت.* گۆشەنشین؛ دوورەپەرێز.

**گوشه‌نشینی** / gûšenešînî /: *اسم.* گۆشەنشینی؛ ئاکنجێتی لە کونجێکی دوور لە خەلک.

**گوشه و کنار** / gûše-vo-kenār ، ـها/: *اسم.* سووچ و قوژبن؛ کونج و قوژبن؛ کون و کاژێر؛ شەقۆق؛ پەنا و پەسیو؛ گۆشە و کەنار؛ شوێنی دوورە دەست و دوور لە ناوەند ‹گوشه و کنار را خوب بگرد! ببین کجا افتاده: سووچ و قوژبن باش بگەڕە! بزا لە کوێ داکەوتووە›: **گوشه‌کنار** *[گفتاری]*

**گوشه و کنایه** / gûše-vo-kenāye ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم. [مجازی]* تانە و تەشەر؛ تەوس و توانج؛ قسەی وا کە بە شێوەیەکی نەک ڕوون و ئاشکرا، سووکایەتی، بەرهەلستی یان ناڕەزایەتی ڕابگەیێنێ: **گوشه‌کنایه** *[گفتاری]*

▣ **گوشه و کنایه زدن:** تانە و تەشەر لێدان/ وەشاندن؛ قسەی تال و سووک بە لای دەمێکەوە کردن ‹تو به غیر از گوشه و کنایه زدن کار دیگری نداری؟!: ئەرێ ئەتۆ لە تانە و تەشەر لیدان بەو لاوە ئیشێکی‌ترت نیە؟!›.

**گوشی** / gûšî ، ـها/: *اسم.* بیستۆک: ۱. دەزگای تەلەفوون کە دەنگی لێوە دەبیسرێت ۲. دەسکی سەر تەلەفوون کە پاش هەلگرتنی پێوەندی تەلەفوونی دادەمەزرێ ۳. کەرستەی گوێ‌گرتنی تاقەکەسی لە دەنگی ئامرازێک بەبێ بلاو بوونەوەی ٤. سەمعەک ٥. گۆشەوانە؛ کەرستەیەک بۆ داپۆشانی گوێ (لە سەرما و سۆلەدا) ٦. *[پزشکی]* کەرستەیەک بۆ گوێ‌گرتن لە دەنگی نێو لەشی گیانداران، بەتایبەت دل.

▣ **گوشی را به دست کسی دادن:** *[کنایی]* کەسێک لە بابەتێ تێگەیاندن. هەروەها: **گوشی دست کسی بودن**

**گوگرد** / gûgerd /: *اسم.* گۆگرد؛ توخمی کیمیایی ناکانزا، بە ژمارە ئەتومی ١٦ و کێشی ئەتومی ٣٢,٠٦، کە ماکێکی زەردە و لە پیشەسازیدا زۆری بەهرە هەیە.

**گوگله** / go(w)gale /: *اسم.* گاڕان؛ گۆبارە؛ گاگەل؛ گایەل؛ کەوال؛ گائەل؛ گاگەلە؛ گەلەگا؛ ناخر؛ ڕەوەی گا و گامێش.

**گول** [1] / gûl /: *اسم. [گفتاری]* گۆل؛ گول؛ فریو.

▣ **گول خوردن:** خەلەتان؛ خلەتان؛ خلەتیان؛ غەلەتیەی؛ فریو خواردن؛ گۆل خواردن ‹من از یک بچه گول خوردم!: مندالێک خەلەتانمی!›.

**گول زدن:** خلەتاندن؛ خەلەتاندن؛ لاباندن؛ غەلەتنای؛ فریو دان؛ گۆل دان؛ گول دای/ دەی ‹با قیافه‌ی مظلومانه‌اش مرا گول زد: بە سەر و سەکوتی هەژارانەیەوە خلەتاندمی›.

**گول کسی/ چیزی را خوردن:** گۆل/ فریوی کەسێ/ شتێ خواردن؛ کلاو کەسێ/ شتێ

سەر چوون ‹کول قیافەاش را خوردم: فریوی سەر و سەکوتیم خوارد›.

**گول²** / ـها/: *صفت.* گەوج؛ دەبەنگ؛ گێل؛ گەمژە؛ حۆل؛ حەپۆل؛ گێلۆکە؛ کەم ئاوەز و گێژ.

**گولزنک** / gûlzanak، ـها/: *اسم.* ١. بیخلەتێنە؛ خلەتێنە؛ منالْخلەتێنە؛ شتێک منداڵی پێبخلافێ ٢. مەمکەمژە؛ مەمکەمژ؛ مەملەمژە؛ پارچە یان لاستیکێکی نەرم بە شێوەی سەر گۆی مەمک بۆ مژ لێدانی منداڵی ساوا.

**گون** / gavan، ـها/: *اسم.* گەون؛ گەڤن؛ گەوەن؛ گوێن؛ گۆنی؛ گێنی؛ گوینی؛ گوێنی؛ گوێنە؛ گوێنو؛ هەنگەوەن؛ هەنگەون؛ هەنگون؛ هەنگەونە؛ پەلۆشە؛ پنجە گیایەکی دڕکاوی خۆڕسکە، کەتیرە و گوندەی لێبەرهەم دێ و بۆ سووتاندن بەکارە.

**ـگون** / gûn/: *پیوازه.* ـ ئاسا؛ ـ سا؛ ـگوێن؛ ـگۆن؛ ـگۆرەبا؛ ـ ڕەنگ؛ ـگێن؛ ـ تەرز؛ ـ جۆ ‹گندمگون؛ آسمان‌گون: گەنماسا؛ ئاسمان‌گوێن›.

**گوناگون** / gûnāgûn/: *صفت.* جۆراوجۆر؛ ڕەنگاوڕەنگ؛ ڕەنگاڕەنگ؛ هەمە چەشنە؛ بە چەشن و چۆنیەتی جیاـجیاوە ‹حیوانات گوناگون: گیانەوەری جوراوجور›.

**گوناگونی** / gûnāgûnî/: *اسم.* جۆراوجۆری؛ هەمەچەشنی.

**گونه¹** / gûne، ـها/: *اسم.* گۆن؛ گۆنە: ١. گۆنا؛ کولم؛ کولمە؛ گوپ؛ گپ؛ لۆپ؛ لام؛ لام؛ دیم؛ دیمە؛ نارک؛ ئارن؛ تەتەڵە ‹گونەهایش سرخ شده بود: گونای سوور هەڵگەڕابوو› ٢. جۆر؛ تەرز؛ چەشن؛ تەخلیت؛ ڕەبات؛ خاوەن هەبوونی، چۆنیەتی یان شێوازی دیاریکراو ‹چند گونه سیب: چەن جور سێو› ٣. بەشێ لە ڕەگەز و بچووکترین یەکەی دەستەبەندی گیانەوەر و گیا، بریتی لە ئەندامانی وەک یەک کە دەتوانن پێکەوە جووت بن.

**ـ گونه²**: *پیوازه.* ـ ئاسا؛ ـگۆن؛ ـگێن؛ ـ تەرز؛ ـ هەزەی؛ ـ شێوە؛ وەکوو کەسێ یان شتێ ‹پیامبرگونه: پێغەمبەرئاسا›.

**گونی** / gûnî/: [هندی]/*اسم.* گۆنی؛ تەلیس؛ گوونی؛ گونی؛ گوێنوو؛ گوونیە؛ گونیە؛ گوش: ١. قوماشی ئەستوور و زبر لە ڕیشاڵەی گیا کە پتر وەک کیسە و بۆ بەننایی بە کار دێ ٢. /ـها/ کیسەی زلی چنراو لەو قوماشە. هەروەها: **گونی‌بافی؛ گونی‌فروشی**

**گونیا** / gûniyā/: [سریانی]/*اسم.* گونیا؛ گۆشەوارە: ١. /ـها/ ئامرازێکی سێ سووچە بە سووچێکی ڕاستەوە، لە پەلاستیک یان کانزا بۆ کێشان و تاقی‌کردنەوەی گۆشەی ڕاست ٢. */نجوم/* کەلوویەک لە ئاسمانی نیوەگۆی باشووریدا.

⊡ **گونیا بودن**: گونیا بوون؛ لە ئاست یەکتر لە سووچی °۹۰ دا بوون. هەروەها: **گونیا کردن**

**گوه** / gove، ـها/: *اسم.* ١. گاوە؛ گۆوە؛ هۆرە؛ ماوش؛ لەتەیەکی درێژووکە لە چێو یان ئاسن بۆ قەڵشاندنی دار یان بەرد، جووڵاندنی شتی قورس یان پڕکردنەوەی قەڵشت و درز بە کار دەڕوا: **گاوە** ٢. لێژایی؛ سەرەولێژی؛ داخز؛ سەرەوخوارکایی.

**گوهر** / gowhar, go:har/: *اسم. /ادبی/* گەوهەر؛ گەوەر؛ گوهەر: ١. /ـها/ بەردی زۆر بە نرخ ٢. ماک؛ دەگەز؛ سروشتی ڕاستەقینە یان سەرەکی شتێک؛ تایبەتمەندیەکانی تاقانە و تایبەت بە شتێک * **گُهر** */مخفف/*

**گوهرشناس** / gowharšenās, go:har-، ـها؛ ـان/: *صفت.* گەوهەرناس: ١. پسپۆڕ لە ناسینەوەی شتی بەنرخ بەتایبەت گەواهیراتدا ٢. */کنایی/* ئەوی بایەخی مرۆی بە جەوهەر و لێهاتوو یان شتی بەنرخ دەزانێ.

**گوی** / gûy، ـها/: *اسم.* گۆ؛ گۆی: ١. تۆپی خڕی دارین بۆ کاشۆبازی ٢. تۆپەڵ؛ شتی خڕ.

⊡ **گوی سبقت را ربودن**: پێشبڕکێ کردن؛ پێش‌کەوتن؛ باقی بەجێ هێشتن ‹در مسابقه

گوی سبقت را از بقیه ربود و اوّل شد: له کێبەرکێدا لەوانیتر پێشبرکێ کرد و یەکەم دەرچوو›.

**گویا** / gûyā/: *صفت.* ١. وێژا؛ بێژەر؛ وێژەر ‹تلفن گویا: تەلەفوونی وێژا› ٢. نیشاندەر؛ ئاشکراکەر؛ دیارخەر ‹رفتارش گویای احوالش بود: ئاکاری نیشاندەری حاڵ و باڵی بوو›.

**گویا** / gû:yā/: *قید.* گوایە؛ گوایا؛ گۆیا؛ چما؛ چمان؛ وەکشتێ؛ وەکچتێ؛ چما ئەیژی؛ ماچی؛ ڕەنگە؛ ڕەنگا؛ ئەیژی ‹گویا می‌دانست آمده‌ام: گوایە دەیزانی هاتووم›.

**گویائی** / gûyā'î/ ☜ **گویایی**

**گویایی** / gûyāyî/: *اسم.* ١. خویایی؛ دیاری؛ ئاشکاری؛ ڕاست و ڕەوانی ٢. وێژایی؛ قەلی؛ دەمتەڕی؛ دەمپاراوی * **گویایی**

**گویچه** / gûyče ، ـها/: *اسم. [زیست‌شناسی]* خڕۆکە؛ گلوبوول؛ هەر کام لە خانەکانی نێو پلاسمای خوێن: **گلبول**

▣ **گویچه‌ی سرخ**: گلوبوولی سوور؛ خڕۆکەی سوور؛ خانەگەلی زەردباوی نێو پلاسما کە سەرجەم پێکەوە ڕەنگی خوێن سوور دەکەن و ئوکسیژن لە سیەوە بۆ شانەکانی لەش و بە پێچەوانەی، گازی کەربون ڕادەگۆزن.

**گویچه‌ی سفید**: خڕۆکەی سپی؛ گلوبوولی سپی؛ زۆرێک خانەی خڕیانە و بێ‌ڕەنگی نێو پلاسمای خوێن کە لەش لە ئاست باکتری و دژمنانی دەرەکی دەپارێزن.

**گویش** / gûyeš ، ـها/: *اسم.* زاراوە؛ زار؛ شێوەزار؛ زاراو: ١. هەر کام لە جۆرەکانی زمانێ کە بە وشە، ڕێزمان و بێژە لە لکەکانیتری ئەو زمانە جیا دەبێتەوە ‹ بادینی از گویش‌های کرمانجی است: بادینی لە زاراوەکانی کرمانجیە› ٢. یەک یان چەن زمانی هاوڕەگ ‹تبری و گیلکی دو گویش ایرانی است: تەبەری و گیلەکی دوو زاراوەی ئێرانین›.

**گویشور** / gûyešvar ، ـان/: *صفت.* ئاخێوەر؛ ئاخەفتەر؛ ئاخەفتیار (تێبینی: زۆرتر بە شێوەی کۆ دێتە نێو ڕستەوە) ‹گویشوران این زبان بیشتر در شمال کردستان سکونت دارند: ئاخێوەرانی ئەم زمانە پتر لە باکووری کوردستاندا دەژین›.

**گویندگی** / gûyandegî/: *اسم.* بوێژی؛ وێژەری؛ وێژنەیی؛ بێژەری؛ پیشە و کاری بوێژ ‹در امتحان گویندگی شرکت کردم: لە ئەزموونی بوێژیدا بەشداریم کرد›.

**گوینده** / gûyande ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* ١. وێژەر؛ وێژنە؛ قسەکەر؛ گۆیندە؛ بوێژ؛ قسەبێژ؛ وێژننە؛ بێژەر؛ کەسێ کە لە ئێزگەی ڕادیۆ و تەلەڤیزیۆندا بۆ بیسەران قسە دەکا ٢. هۆنەر؛ شاعیری شیعر و گۆرانی.

**گویی**[1] / gûyî/: *قید. [ادبی]* دەڵێی؛ ئەڵێی؛ ئەیژی؛ ئێژی؛ ماچی؛ مەری؛ گوایە؛ گوایا؛ چما؛ چمان؛ چمای؛ چمانیگ ‹گویی اهل این آب و خاک نیست: دەڵێی خەڵکی ئەم وڵاتە نیە›: **گوئی**

**ـ گویی**[2]: *پیوازه.* ـ بێژی؛ ـ وێژی ‹سخنگویی: قسەبێژی›: **ـ گوئی**

**گه** / gah/: *قید. [ادبی، مخفف]* تاو؛ گاو؛ گا؛ گاهـ ؛ گەه ‹گهی بر درد بی‌درمان بگریم/ گهی بر حال بی‌سامان بخندم!: تاوێ دەگریم بۆ دەردی بێ‌دەرمانم / گاوێ پێدەکەنم بە حاڵی جوانم!›.

**گه** / goh/: *اسم. [مستهجن]* گوو؛ گە؛ فژوو؛ تڵتەی خۆراکی گیانەوەران بەتایبەت مرۆ کە لە ڕیخۆڵەوە دەرژێتە دەر.

▣ **گه خوردن**: *[کنایی]* گوو خواردن؛ غەڵەت کردن؛ کاری ناڕەوا کردن.

**گه زدن**: *[کنایی]* تێ‌ڕیان؛ گوو تێ‌کردن؛ گوو کەردەنەی؛ خراپ یان پیس‌کردن.

**گه زیادی خوردن**: *[کنایی]* گووی مفت خواردن؛ گووی زیایی خواردن؛ خۆ تێ‌کوتان و تێکدان.

**به گه خوردن افتادن**: *[تعریض]* کەوتنە/ کەفتنە گوو خواردن؛ کەوتەی گوو واردەی؛

پەشیمان بوونەوە و داوای لێبوردوویی‌کردن.

بە گە کشیدن: *[کنایی]* گوو تێ‌کردن؛ گواوی کردن؛ زۆر خراپ یان پیس‌کردن.

**گەخوردن‌نامە** / gohxordannāme/: *اسم. [مجازی، مستهجن]* تۆبەگوو؛ تۆبەنامە (لە زاراوەی زیندانیاندا).

**گهر** / gohar/ ☜ **گوهر**

**گە کاری** / gohkārî/: *اسم. [مستهجن]* گووکاری؛ گەنەکاری؛ خراپەکاری؛ کاری ناحەز و دزێو.

**گهگاه** / gahgāh/: *قید. [مخفف]* گاـگا؛ گاف‌ـگاف؛ تاوـ تاو؛ جارـجار؛ جاروبارە ‹گهگاه بە من سری می‌زند: گاـگا سەرێکم لێ دەدا›.

**گەگیجە** / gohgîce/: *اسم. [مستهجن]* گێژ و وێژی؛ گێج و وڕی؛ هاژ و واژی؛ سەرگەردانی؛ سەر لێشێواوی.

▣ **گە گیجە گرفتن**: *[تعریض]* سەر بوونە ئاش و قنگ بوونە ماش؛ ماڵ لە باڵەکان و قنگ لە کۆچەکان بوون؛ گێژ و وێژ بوون؛ سەر لێشێوان ‹آنقدر کار داشت کە گەگیجە گرفتە بود: ئەوەندەی کار هەبوو سەری ببووە ئاش و قنگی ببووە ماش›.

**گهگیر** / gahgîr/: *صفت.* تاوـ تاو؛ گڕ و پف؛ وەها کە لە مەودایەکی دیاریکراودا دامرکێ و دیسان سەر هەڵداتەوە (بەتایبەت بۆ ژان).

**گهوارە** / gahvāre ، ـها/: *اسم.* لانک؛ لانکە؛ لاندک؛ لەهندک؛ دێدیک؛ دەیدەک؛ دەیدیک؛ دێدی؛ بێشکە؛ بێشک؛ بێشکێ؛ دەرگووش؛ دەرگوش؛ دەکووش؛ گەرگووش؛ دەرگوشک؛ کورنک؛ ماتک؛ گاوارە؛ لەلوو؛ مەهەک؛ مەهدک؛ هەلۆرک؛ هەلۆرکە؛ هەلوورک؛ هەلویرک؛ هەلوولک؛ هەلوولکی؛ جێخەوێک بۆ منداڵی ساوا کە لە سەر دوو کەوانە دەلەقێت یان بە چەن قولاپەوە شۆڕ دەبێتەوە: **گاهوارە**

**گهی** / gahî/ ☜ **گاهی**

**گهی** / gohî/: *صفت. [مستهجن]* گوواوی؛ گووین؛ گووینە؛ بە گووەوە تلاو.

**ـگی** / gî/: *پسوند.* ـ یی؛ ـ ی؛ ـ ئەتی؛ ـ ئێتی؛ ـ یەتی؛ پاشگری هەبوونی بۆ ئەو تاقمە وشەیانە وا ئاخر پیتیان هێ «ە» نەگوتراوە، (وەک: شایستە ← شایستگی: هێژا ← هێژایی).

**گیا** / giyā/: *اسم.* گیا؛ گیواو؛ گژ و گیا؛ سەرجەمی ڕوەکی ناوچە یان وڵاتێک.

**گیابن** / giyābon/: *اسم. [قدیمی]* بنج؛ پنج؛ پنچ؛ پنجاڕ؛ پنچک؛ پرچک؛ بنجە؛ بنەگیا؛ پنچکەگیا؛ بنجەگیواو؛ کان.

**گیاخاک** / giyāxāk/: *اسم.* خاکەڕەشە؛ بەرهەمی پرتووکانی گیا و گیانەوەر کە دەبێتە خاکێکی قاوەیی و ڕەش و بەشی ئالی خاک پێک دێنێت.

**گیاه** / giyāh ، ـها؛ ـان/: *اسم.* گیا؛ گها؛ گیوا؛ گیواو؛ گەیا؛ شینکە؛ ڕوەک بە گشتی.

▣ **گیاه آبزی**: گیای ئاوژی؛ گیای ئاوی؛ گیای نێو زۆنگ و ئاو.

**گیاه گوشتخوار**: گیای گۆشتخۆر؛ ئەو گیایانەی کە جڕ و جانەوەری بچووک دەخۆن و لە هەڵتاواندنیان خۆراکی پێویستیان بەرهەم دێنن.

**گیاه گوشتدار**: گیای گۆشتن؛ تاقمێک ڕووەکی وشکانی کە ئاو هەڵدەمژن و پاشەکەوتی دەخەن و زۆر گۆشتنن دێنە بەرچاو (وەک کاکتووس).

**گیاه هوایی**: گیای هەوایی؛ گیایێ کە بنی لە زەویدا نیە و بە گیای‌ترەوە هەڵدەگەڕێ، بەڵام لامز نیە.

**گیاهخانە** / giyāhxāne ، ـها/: *اسم.* گیاخانە؛ دیوێک لە ئەزموونگەی ڕوەکناسیدا بۆ تۆژینەوە، چاودێری و پەروەردەکردنی گیا.

**گیاهخوار** / giyāhxār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* گیاخۆر؛ گیواوەر: ١. فێرەگیا؛ چەشتەی گیا؛ هۆگری گیاخواردن و بەس ‹گاندی گیاهخوار بود: گاندی

گیاخۆر بوو› ٢. بە تایبەتمەندی خواردنی گیا ‹جانور گیاهخوار: گیانەوەری گیاخۆر›.

**گیاهخواری** / giyāhxārî/: اسم. گیاخۆری؛ گیاووەری: ١. کار و ڕەوتی بژیوکردن لە گیا ٢. تایبەتمەندی ئەو گیانەوەرانەی گیا دەخۆن.

**گیاهشناسی** / giyāhšenāsî/: اسم. گیاناسی؛ ڕووەکناسی؛ لقێک لە زانستی ژیناسی کە لە سەر گژ وگیا دەکۆڵێتەوە. هەروەها: **گیاهشناس**

**گیاهک** / giyāhak/: اسم. نێرکە؛ چووزە؛ بەشی ڕووەکی گیا لە تۆمدا کە لە بار و دۆخی گونجاوی خوێدا دەڕوێ و دەبێتە گیایەکی تازە.

**گیاهی** / giyāhî/: صفت. گیایی؛ گیاوی؛ ڕووەکی؛ سەر بە گیا ‹الیاف گیاهی: ڕیشاڵەی گیایی›.

**گیبون** / gîbon، ـها/:[؟]/اسم. گیبۆن؛ گیانەوەرێکی مرۆئاسای گچکەیە بە دەست و پێی درێژ و بێکلک، لە سەر دوو پێی دەڕوا و بە سەر دارانەوە دەژی: **ژیبۆن**

**گیپا** / gîpā/: اسم. گیپە؛ گیپار؛ گیپاری؛ گیپێ؛ گەگگ؛ گاگ؛ کیپا؛ کیپار؛ کیپاری؛ پارچە کرشی پڕ کراو لە ساوار یان برنج و کوڵێندراو.

**گیپور** / gîpûr/: [فرانسوی]/اسم. گیپوور؛ جۆرێ پارچەی تۆڕی زبرە بە نەخشی بەرز و نزمەوە.

**گیتار** / gîtār ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. گیتار؛ سازی ژێداری پشت و ڕوو تەخت بە دەسکێکەوە کە قورمیشی کۆکی لە سەرە و شەش تەڵی پێوەیە، بە قامک یان پێژەن دەژەنرێت.

▣ **گیتار برقی**: گیتاری کارەبایی؛ گیتارێ کە دەنگەکەی بە کەرستەی کارەبایی بەهێز دەکرێتەوە.

**گیتی** / gîtî/: اسم. [ادبی] ١. جیهان؛ گێتی؛ سەرجەمی جەهان لە وردە تۆزێکەوە تا کاکەشانان و دوورەدەستان ٢. زەوی؛ زەوین؛ گۆی زەمین.

**گیج** / gîc/: صفت. گێژ؛ گێج؛ گیج؛ گێر؛ هێڕ؛ هیر؛ هوڕ؛ هووڕ ٢. وڕ؛ واژ؛ هاژ؛ لاسەر؛ وەم؛ وەیل؛ ویل؛ زۆر فەرامۆشکار ٣. کاس؛ تاس؛ سەرسام؛ تووشی سەرەگێجە.

▣ **گیج رفتن/ خوردن**: گێژ خواردن؛ گێژ بردن؛ سەر لە گێژەوە هاتن/ چوون.

**گیج شدن**: گێژ بوون؛ هوڕمان؛ وڕمان؛ وڕ بوون؛ هۆر بوون؛ تاسان؛ تاسیان؛ حەپەسان؛ تاس بردنەوە؛ تاسین؛ کاس بوون؛ کاس بین؛ کەوشین؛ تاسیەی؛ تاسیای؛ گێج بیەی: ١. لە دەست دانی دەسەڵاتی بیر و هۆش ٢. لە بیر چوونەوەی بڕێ زانیاری یان هەموو زانیاریەک. هەروەها: **گیج کردن**

**گیجگاه** / gîcgāh/: اسم. لاجان؛ لاجانگ؛ شیشنگ؛ جاینک؛ گێجەنە؛ بەشی سەرووی نێوان گوێ و چاو.

**گیج و ویج** / gîc-o-vîc/: صفت. [گفتاری] گێژ و وێژ؛ گێج و وڕ؛ هێڕ؛ گێژ و واژ؛ گێژ و حوڵ؛ هاژ و کاژ؛ هاژ و واژ.

**گیجی** / gîcî/: اسم. کاسی؛ وڕی؛ گێژی؛ گێجی؛ تاسی؛ هۆری؛ قاڕە؛ سەرگێژی؛ سەرخولێ؛ لاسەری؛ سەرسامی.

**گیر** [1] / gîr/: اسم. [گفتاری] گیر: ١. ـها/ گرفت؛ گەپل؛ لەمپەر؛ ئەوەی بەر بە بزووتنەوە و ڕەوتی شتێک دەگرێ ‹این قلم گیر دارد درست نمی‌نویسد: ئەم قەڵەمە گیری هەیە باش نانووسێ› ٢. گلیک؛ گریک؛ هێزی گرتن ‹دستم گیر نداشت: دەستم گلیکی نەبوو› ٣. گرفت؛ دژواری؛ تەنگ و چەڵەمە ‹کارم گیر پیدا کرده است: کارەکەم تووشی گرفت بووە›.

▣ **گیر آوردن**: دۆزینەوە؛ وە گیر هێنان؛ پەیدا/ پەیا کردن؛ گیر خستن/ هێنان/ هاوردن؛ وە گیر هاوردن؛ بەرگیر خستن؛ هێنانە گیر؛ ڕادەستکردن؛ بە دەست هێنان؛ وە دەست هاوردن؛ یۆستەیوە؛ ئەوەدیەی ‹یک خانەی خوب گیر آوردم: ماڵێکی باشم وە گیر هێنا›.

پەشیمان بوونەوە و داوای لێبوردوویی کردن.
بە گە کشیدن: *[کنایی]* گوو تێ کردن؛ گواوی کردن؛ زۆر خراپ یان پیس کردن.

**گەخوردن‌نامە** / gohxordannāme/: *اسم.* *[مجازی، مستهجن]* تۆبەگوو؛ تۆبەنامە (لە زاراوەی زیندانیاندا).

**گهر** / gohar/ ☜ **گوهر**

**گە کاری** / gohkārî/: *اسم.* *[مستهجن]* گووکاری؛ گەنەکاری؛ خراپەکاری؛ کاری ناحەز و دزێو.

**گهگاه** / gahgāh/: *قید.* *[مخفف]* گا-گا؛ گاف-گاف؛ تاو- تاو؛ جار-جار؛ جاروبارە ‹گهگاه بە من سری می‌زند: گا-گا سەرێکم لێ دەدا›.

**گە گیجە** / gohgîce/: *اسم.* *[مستهجن]* گێژ و وێژی؛ گێج و وڕی؛ هاژ و واژی؛ سەرگەردانی؛ سەر لێ‌شێواوی.

▣ **گە گیجە گرفتن:** *[تعریض]* سەر بوونە ئاش و قنگ بوونە ماش؛ ماڵ لە باڵەکان و قنگ لە کۆچەکان بوون؛ گێژ و وێژ بوون؛ سەر لێ‌شێوان ‹آنقدر کار داشت کە گەگیجە گرفتە بود: ئەوەندەی کار هەبوو سەری ببووە ئاش و قنگی ببووە ماش›.

**گهگیر** / gahgîr/: *صفت.* تاو- تاو؛ گڕ و پف؛ وەها کە لە مەودایەکی دیاریکراودا دامرکێ و دیسان سەر هەڵداتەوە (بەتایبەت بۆ ژان).

**گهوارە** / gahvāre، ـها/: *اسم.* لانک؛ لانکە؛ لاندک؛ لەهندک؛ دێدیک؛ دەیدەک؛ دەیدیک؛ دێدی؛ بێشکە؛ بێشک؛ بێشکێ؛ دەرگووش؛ دەرگوش؛ دەکووش؛ گەرگووش؛ دەرگوشک؛ کورنک؛ ماتک؛ گاوارە؛ لەلوو؛ مەهەک؛ مەهدک؛ هەلۆرک؛ هەلۆرکە؛ هەلوورک؛ هەلویرک؛ هەلوولک؛ هەلوولکی؛ جێ‌خەوێک بۆ منداڵی ساوا کە لە سەر دوو کەوانە دەلەقێت یان بە چەن قولاپەوە شۆڕ دەبێتەوە: **گاهوارە**

**گهی** / gahî/ ☜ **گاهی**

**گهی** / gohî/: *صفت.* *[مستهجن]* گوواوی؛ گووین؛ گووینە؛ بە گووەوە تلاو.

**-گی** / gî/: *پسوند.* - یی؛ - ی؛ - ئەتی؛ - ئێتی؛ - یەتی؛ پاشگری هەبوونی بۆ ئەو تاقمە وشەیانە وا ئاخر پیتیان هێ «ە» نەگوتراوە، (وەک: شایستە ← شایستگی: هێژا ← هێژایی).

**گیا** / giyā/: *اسم.* گیا؛ گیواو؛ گژ و گیا؛ سەرجەمی ڕووەکی ناوچە یان وڵاتێک.

**گیابن** / giyābon/: *اسم.* *[قدیمی]* بنج؛ پنج؛ پنچ؛ پنجاڕ؛ پنچک؛ پرچک؛ بنجە؛ بنەگیا؛ پنچکەگیا؛ بنجەگیواو؛ کان.

**گیاخاک** / giyāxāk/: *اسم.* خاکەڕەشە؛ بەرهەمی پرتووکانی گیا و گیانەوەر کە دەبێتە خاکێکی قاوەیی و ڕەش و بەشی ئالی خاک پێک دێنێت.

**گیاه** / giyāh، ـها؛ ـان/: *اسم.* گیا؛ گها؛ گیوا؛ گیواو؛ گەیا؛ شینکە؛ ڕووەک بە گشتی.

▣ **گیاه آبزی:** گیای ئاوژی؛ گیای ئاوی؛ گیای نێو زۆنگ و ئاو.

**گیاه گوشتخوار:** گیای گۆشتخۆر؛ ئەو گیایانەی کە جڕ و جانەوەری بچووک دەخۆن و لە هەڵتاواندنیان خۆراکی پێویستیان بەرهەم دێنن.

**گیاه گوشتدار:** گیای گۆشتن؛ تاقمێک ڕووەکی وشکانی کە ئاو هەڵدەمژن و پاشەکەوتی دەخەن و زۆر گۆشتنن دێنە بەرچاو (وەک کاکتووس).

**گیاه هوایی:** گیای هەوایی؛ گیایێ کە بنی لە زەویدا نیە و بە گیای ترەوە هەڵدەگەڕێ، بەڵام لامژ نیە.

**گیاهخانە** / giyāhxāne، ـها/: *اسم.* گیاخانە؛ دیوێک لە ئەزموونگەی ڕووەکناسیدا بۆ تۆژینەوە، چاودێری و پەروەردەکردنی گیا.

**گیاهخوار** / giyāhxār، ـها؛ ـان/: *صفت.* گیاخۆر؛ گیواوەر: ١. فێرەگیا؛ چەشتەی گیا؛ هۆگری گیاخواردن و بەس ‹گاندی گیاهخوار بود: گاندی

گیاخۆر بوو›. ۲. بە تایبەتمەندی خواردنی گیا ‹جانور گیاهخوار: گیانەوەری گیاخۆر›.

**گیاهخواری** / giyāhxārî/: اسم. گیاخۆری؛ گیاوووەری: ۱. کار و ڕەوتی بژیوکردن لە گیا ۲. تایبەتمەندی ئەو گیانەوەرانەی گیا دەخۆن.

**گیاەشناسی** / giyāhšenāsî/: اسم. گیاناسی؛ ڕوەکناسی؛ لقێک لە زانستی ژیناسی کە لە سەر گژ وگیا دەکۆڵێتەوە. هەروەها: **گیاەشناس**

**گیاهک** / giyāhak/: اسم. نێرکە؛ چووزە؛ بەشی ڕوەکی گیا لە تۆمدا کە لە بار و دۆخی گونجاوی خۆیدا دەڕوێ و دەبێتە گیایەکی تازە.

**گیاهی** / giyāhî/: صفت. گیایی؛ گیاوی؛ ڕوەکی؛ سەر بە گیا ‹الیاف گیاهی: ڕیشاڵەی گیایی›.

**گیبون** / gîbon ، ـها/: [؟] اسم. گیبۆن؛ گیانەوەرێکی مرۆئاسای گچکەیە بە دەست و پێی درێژ و بێ کلک، لە سەر دوو پێی دەڕوا و بە سەر دارانەوە دەژی: **ژیبۆن**

**گیپا** / gîpā/: اسم. گیپە؛ گیپار؛ گیپاری؛ گیپێ؛ گەگگ؛ گاگ؛ کیپا؛ کیپار؛ کیپاری؛ پارچە کرشی پڕ کراو لە ساوار یان برنج و کوڵێندراو.

**گیپور** / gîpûr/: [فرانسوی] اسم. گیپوور؛ جۆرێ پارچەی تۆڕی زبرە بە نەخشی بەرز و نزمەوە.

**گیتار** / gîtār ، ـها/: [فرانسوی] اسم. گیتار؛ سازی ژێداری پشت و ڕوو تەخت بە دەسکێکەوە کە قورمیشی کۆکی لە سەرە و شەش تەڵی پێوەیە، بە قامک یان پێژەن دەژەنرێت.

▣ **گیتار برقی**: گیتاری کارەبایی؛ گیتارێ کە دەنگەکەی بە کەرستەی کارەبایی بەهێز دەکرێتەوە.

**گیتی** / gîtî/: اسم. [ادبی] ۱. جیهان؛ گێتی؛ سەرجەمی جەهان لە وردە تۆزێکەوە تا کاکەشانان و دوورەدەستان ۲. زەوی؛ زەوین؛ گۆی زەمین.

**گیج** / gîc/: صفت. گێژ؛ گێج؛ گیج؛ گێر؛ هێڕ؛ هیر؛ هوڕ؛ هووڕ ۲. وڕ؛ واژ؛ هاژ؛ لاسەر؛ وەم؛ وەیل؛ ویل؛ زۆر فەرامۆشکار ۳. کاس؛ تاس؛ سەرسام؛ تووشی سەرەگێجە.

▣ **گیج رفتن/ خوردن**: گێژ خواردن؛ گێژ بردن؛ سەر لە گێژەوە هاتن/ چوون.

**گیج شدن**: گێژ بوون؛ هوڕمان؛ وڕمان؛ وڕ بوون؛ هۆر بوون؛ تاسان؛ تاسیان؛ حەپەسان؛ تاس بردنەوە؛ تاسین؛ کاس بوون؛ کاس بین؛ کەوشین؛ تاسیەی؛ تاسیای؛ گێج بیەی: ۱. لە دەست دانی دەسەڵاتی بیر و هۆش ۲. لە بیر چوونەوەی بڕێ زانیاری یان هەموو زانیاریەک. هەروەها: **گیج کردن**

**گیجگاه** / gîcgāh/: اسم. لاجان؛ لاجانگ؛ شیشنگ؛ جاینک؛ گێجەنە؛ بەشی سەرووی نێوان گوێ و چاو.

**گیج و ویج** / gîc-o-vîc/: صفت. [گفتاری] گێژ و وێژ؛ گێج و وڕ؛ هێڕ؛ گێژ و واژ؛ گێژ و حۆل؛ هاژ و کاژ؛ هاژ و واژ.

**گیجی** / gîcî/: اسم. کاسی؛ وڕی؛ گێژی؛ گێجی؛ تاسی؛ هۆری؛ قاڕە؛ سەرگێژی؛ سەرخولێ؛ لاسەری؛ سەرسامی.

**گیر**[۱] / gîr/: اسم. [گفتاری] گیر: ۱. ـها/ گرفت؛ گەپل؛ لەمپەر؛ ئەوەی بەر بە بزووتنەوە و ڕەوتی شتێک دەگرێ ‹این قلم گیر دارد درست نمی‌نویسد: ئەم قەڵەمە گیری هەیە باش نانووسێ› ۲. گلیک؛ گریک؛ هێزی گرتن ‹دستم گیر نداشت: دەستم گلیکی نەبوو› ۳. گرفت؛ دژواری؛ تەنگ و چەڵەمە ‹کارم گیر پیدا کرده است: کارەکەم تووشی گرفت بووە›.

▣ **گیر آوردن**: دۆزینەوە؛ وە گیر هێنان؛ پەیدا/ پەیا کردن؛ گیر خستن/ هێنان/ هاوردن؛ وە گیر هاوردن؛ بەرگیر خستن؛ هێنانە گیر؛ ڕادەستکردن؛ بە دەست هێنان؛ وە دەست هاوردن؛ یۆستەیوە؛ ئەوەدیەی ‹یک خانەی خوب گیر آوردم: ماڵێکی باشم وە گیر هێنا›.

گیر دادن: گیر دان: ۱. بەستنەوە؛ بینتەیوە؛ گری دان ۲. گیر پێدان؛ لەسەر شتێک رۆیشتن ‹گیر نده! بگذار کارم را بکنم: گیرم پی مەدە! با کارەکەم بکەم›.

گیر داشتن: ۱. گیر هەبوون؛ تووشی گیر و گرفت بوون ۲. خاوەنی هێز و وزە بوون بۆ گرتنی شتێک.

**گیر** [۲]: *صفت. [گفتاری]* گیرۆدە؛ گرفتار؛ تووشیار؛ گیر؛ ئەوگار.

▣ گیر افتادن: گیران؛ گیر خواردن؛ گیرکەفتن؛ گرفتار بوون؛ تووش بوون؛ پێوە بوون؛ هاتنە گرتن؛ گیر واردەی؛ گیرکەردەی؛ کەوتنە گیر ‹رفته بود دزدی، گیر افتاد: چبوو بۆ دزی، گیرا›.

گیر انداختن: دانە گیر؛ گیر خستن؛ گرتن؛ گرفتارکردن ‹همکارش او را گیر انداخت: هاوکارەکەی دایە گیر›.

گیر بودن: گیران؛ گرفتار بوون؛ گیر بوون ‹دست من گیر است خودت بردار: دەستم گیراوە خۆت هەڵگرە›.

گیر کردن: گیر خواردن؛ گیرکردن: ۱. تووشی گرفت بوون ‹کارم در شهرداری گیر کرده است: کارم لە شارەداریدا گیری خواردووە› ۲. گیران؛ چقیان؛ ئاوقای شتێک بوون و لە رۆشتن کەوتن و خەسار دیتن ‹لباسم گیر کرد به میخ و پاره شد: جلەکەم لە مێخەکە گیرا و درا›.

**ـ گیر** [۳]: *پیوازه.* ـگر؛ ـگیر؛ ـگێر: ۱. گیرۆدە؛ تووشیار ‹دستگیر: دەستگیر› ۲. ئەوەی شتێ دەگرێ ‹ماهیگیر: ماسیگر› ۳. وەبەر شتێک ‹بادگیر؛ آفتابگیر: باگر؛ خۆرگر›.

**گیرا** / gîrā/: *صفت.* گیرا؛ ڕاکێشەر؛ دڵگر؛ سەرنجڕاکێش؛ دڵسێن ‹صدای گیرا: دەنگی گیرا›.

**گیرائی** / gîrā'î/ ☜ **گیرایی**

**گیراندن** / gîrāndan/: *مصدر. متعدی.* // **گیراندی:** پێتکرد؛ **می‌گیرانی:** پێدەکەی؛ **بگیران:** پێبکە// پێ کردن؛ داگیرساندن؛ داگرساندن؛ ئاییساندن؛ هەڵکردن؛ هەڵگرساندن؛ گرنای؛ گرنەی؛ ئەنەگیسنەی؛ گیسنایەنە. هەروەها: **گیراندنی**

■ صفت مفعولی: **گیرانده** (پێکراو)

**گیرانه** / gîrāne/ ☜ **قو**

**گیرایی** / gîrāyî/: *اسم.* دڵگری؛ دڵبزوێنی؛ دڵگەشێنی؛ گیرایی ‹گیرایی آوازش همه را افسون کرده بود: دڵگری دەنگی هەمووی ئەفسوون کردبوو›: **گیرائی**

**گیربکس** / gîrboks، ـها/: [از انگلیسی]/*اسم.* گیربوکس؛ جەعبەی دەندە؛ دەزگایەک لە ماشیندا بۆ بەهێز یان خێرا کردنەوە یا بەرەو پاش بردن.

**گیرنده** / gîrande، ـها/: *اسم.* ۱. /ـگان/ وەرگر؛ وەگر؛ بگیر؛ بگر: *الف)* ئەوەی دەگرێ ‹گیرندەی نامە: وەرگری نامە› *ب) [پزشکی]* نەخۆشێ کە ئەندامێکی ساغی پێوە پێوەند دەکرێ. بەرانبەر: **دهنده** ۲. پێگر؛ پێگیر: *الف)* ئەندامی هەستیار کە بۆ شتێک وریایە و دەیناسێتەوە ‹گیرندەی حسی؛ گیرندەی بو: پێگری هەست؛ پێگیری بۆن› *ب)* دەزگای وەرگرتنی دەنگ و ڕەنگ ‹گیرندەی صوتی: پێگری دەنگ›.

**گیرودار** / gîr-o-dār، ـها/: *اسم.* هات و هاوار؛ گێرە و کێشە؛ بگرە و بەردە؛ گیرە و بەردە؛ گیرودار؛ مەوێسە و دەرچۆ؛ بار و دۆخی تووش و نالەبار وێڕای شەڕ و شڵەژاوی ‹در این گیر و دار او هم آمده بود پول می‌خواست!: لەم هات و هاوارەدا ئەویش هاتبوو پارەی دەویست!›.

**گیره** / gîre، ـها/: *اسم.* گیرە؛ گیرکە؛ مارش؛ تەڵ؛ کەرستەیەک بۆ ڕاگرتن و گووشانی شتێک ‹گیرەی مو: گیرەی قژ›.

**ـگیری** / gîrî/: *پیوازه.* ـگری؛ ـگیری؛ کار و ڕەوتی گرتن ‹آبمیوه‌گیری: ئاومیوەگری›.

**گیس** / gîs، ـها/: *اسم. [مخفف، گفتاری]* پرچ؛ کەزی؛ گیز؛ کەزیە؛ گیس؛ گێسی؛ گیسک؛ پۆڕ؛ زولف؛ زلف؛ تیت؛ بسک؛ پسک؛ گجک؛ مووی

درێژی سەر.

**گـیس‌بنـد / gîsband**، ـهـا/: /اسـم. گێسـەوانە؛ توورەکەی تۆڕی بۆ کۆکردنـەوە و تـێ خسـتنی پرچ و گیسی سەر.

**گـیس‌سـفید / gîs.sefîd**، ـهـا؛ ـان/: /اسـم. پۆپ‌چەرموو؛ پۆپ‌چەرمگ؛ ژنی بـە سـالاچووی بە ئەزموون. بەرانبەر: **ریش‌سفید**

**گیسو / gîsû**/: /اسم. ۱. *[ادبی]* کەزی؛ پـرچ؛ گیـز؛ کەزیە؛ گیس؛ گێسی؛ پۆڕ؛ زلف؛ بسـک؛ پسـک؛ هەیوەجان؛ زولف؛ گجک؛ قژی درێـژ ۲. *[نجوم]* کەلوویەکی ئاسمانی نیوەگۆی بـاکووری: **شَـعر بِرینکه**

◘ **گیسو افشاندن:** *[ادبی]* قژ بـەرەودان؛ ئەگریجـە بەردانەوە.

**گیشـا / geyšā, gîšā**، ـهـا/: [انگلیسـی/ فرانسوی از ژاپنـی]/اسـم. گیشـا؛ ژنی ژاپـونی بارهـاتوو بـۆ ڕابواردن و خۆشگوزەرانی پیاوان.

**گیشه / gîše**، ـها/: [فرانسـوی]/اسـم. ئـۆدە؛ هـۆدە؛ گیشه؛ باجـە؛ شـوێنێکی چکۆلـە بـۆ فرۆشـتنی شتێک یا جێبەجێ کردنی کارێک ‹گیشه‌ی بانک: گیشەی بانک›.

**گـیلاس / gîlās**، ـهـا/: /اسـم. گـێلاس؛ گـیلاس: ۱. گلیار؛ گەلاز؛ گەلاس؛ دار یان دەوەنی گـوڵ سپی هێشوویی درێژ و گەڵا ددانەدار ۲. گلیـار؛ گەلاز؛ گەلاس؛ میوەی ئـەو دارە بـە ڕەنگگـەلی زەرد یان نارنجی، کە ئاودار و گۆشتن و شیرینە و دەخورێ ۳. گلاس؛ پەرداخ؛ قـەرەس؛ لیـوانی بلـۆری بەتایبـەت پایـەدار، بـۆ خواردنـەوەی ئەلکولی.

◘ **گیلاس وحشی** ☜ **آل‌اسبی**

**گیلک / gîlak**، ـها؛ ـان/: /اسم. گیلـەک؛ خەڵـکی گیلان (پارێزگایەک لە باکووری ئێران).

**گیلکی[1] / gîlakî**/: /اسم. گیلەکی؛ زمانێ لە زمانـە ئێرانیەکان کە لە گیلاندا باوە.

**گیلکی[2]:** *صفت.* گیلەکی؛ سەر بە گیلەک.

**گیلـویی / gîlûyî**/: /اسـم. گیلـوویی؛ گەچبـڕی پەراوێزی میچ و سەر دیوار.

**گیلـه‌مرد / gîlemard**، ـهـا؛ ـان/: /اسـم. پیـاوی گیلەکی؛ پیاوی خەڵکی گیلان.

**گـیم / geym**، ـهـا/: [انگلیسـی]/اسـم. ۱. *[ورزش]* گەڕ؛ دەور؛ خول ‹گیم اوّل ۵ بر ۳ تمام شد: گـەڕی یەکەم ۵ بـە ۳ کۆتـایی هـات› ۲. گەمـە؛ کایـەی کەمپیوتەری.

**ـ گین / gîn**/: *پسوند.* ـــ یـن؛ خـاوەن و بەشـدار ‹غمگین: خەمین›.

**گیوتین / giyotîn**، ـها/: [فرانسوی]/اسم. گیۆتین: ۱. کەرستەی پێکوشـتن بـە تێخەیـەکی تیـژ و قورسەوە کـە لـە ناوکـاری چوارچێوەیەکـدا لـە سـەرەوە بـەر دەبێتـەوە و مـل دەپـەڕێنێ ۲. کەرستەیەکی وا بـۆ بـڕینی کاغـەز، پـەڕەی ئاسن و....

**گیومه / giyûme**، ـها/: [فرانسوی]/اسم. دووکەوان؛ جووت‌کەوان؛ نیشانەیەکی خاڵبەندی بە شێوەی «» بۆ: *الف)* تێدانانی قسەی کەسێک جگـە لـە نووسەر *ب)* دەرخستن و زەق‌کردنی وشـە یـان دەستەواژەیەک.

**گیوه / gîve**، ـها/: /اسم. گیوە؛ کلاشی بن‌چـەرم؛ کالە؛ کالەک؛ جۆرێ کەوشی هاوینی دەسـتچن لە بەن و بن‌جیر کـە پاژنـەی نیـە. هـەروەهـا: **گیوه‌بافی؛ گیوه‌دوزی؛ گیوه‌فروشی**

◘ **درگیوه گشاد:** *[کنـایی]* تەپـەڵۆس؛ تـەوەزەل؛ قنگ‌قورس؛ تەمەڵ؛ لاسار؛ گەڵ و گوشا.

◘ **گیـوه را ورکشـیدن:** *[کنـایی]* کـلاش لـێ هەڵکێشان؛ کلاش هۆرکێشـتەی؛ خـۆ تـەیار کردن بۆ کار ‹باید گیوه را ورکشید و افتاد بـە نـان درآوردن: دەبێ کلاشی لێ هەڵکیشـی و بکەویتـە نان دەرهێنان›.

**گیـــوه‌دوز / gîvedûz**/: /اســـم. گیـــوەچن؛ کالـەدروو. هـەروەها: **گیـوه‌دوزی؛ گیـوه‌بـافی؛ گیوه‌فروشی**

# ل

**ل** / l/: حـرف. ل؛ نیشـانەی بیسـت‌وحەوتـەمین پیتی ئەلف‌وبێی زمانی فارسی.

**ل** / le/: اسم. لێ؛ ناوی بیست‌وحەوتەمین پـیتی ئەلف‌وبێتکەی فارسی.

**لا**[1] / lā/: اسم. لا: ١. ـها/ بەین؛ تۆ؛ تـوێ؛ پـەن؛ پـەنا؛ کـەلێنی نێـوان درز، قەڵشـت، دەق یـان ئاوەڵایی شتێک ‹لای در؛ لای کتاب: بـەین درگـا؛ توی کتێب› ٢. [فرانسوی] *[موسیقی]* شەشـەمین نوتی مووسیقا ٣. قەو؛ قەد؛ دەق؛ تۆی؛ تـۆ؛ تـا؛ لۆ؛ لانە؛ ئەوەی بە سەر یەکدا نووشتاوەتەوە ‹دو لا شدن: دوو قەد بوون›.

▣ **بـرای لای جـرز خـوب بـودن:** *[مجـازی]* بـۆ گێرەیش نەبوون؛ پەلە پووشێ نەهێنان؛ بەکار هیچ نـەهاتن؛ پـەی مـەردەی خـاس بیـەی؛ بێ‌قازانج و ناکارامە بوون ‹اینهـا کـه دور خـودت جمع کردەای برای لای جرز خوبند: ئەمانە لە دەوری خۆت کۆت کردوونەوە بۆ گێرەیش نابن›.

**ـلا**[2]: *پیوازە.* ـ لۆ؛ ـ لۆنە؛ ـ لانە؛ ـ لا؛ ـ بەر؛ ـ قەد؛ ـ قەو؛ ـ تا؛ بـە چـەن ڕێسـە یـان دەقـەوە ‹نخ چهارلا؛ پارچەی دولا: بەنی چوارلۆ؛ پارچەی دووقەد›.

**لا**[3]: [عربی] حرف. بێ؛ لا؛ نـا؛ نـە؛ پـیتی بێـوەری کردن ‹لاقید؛ لامذهب: بێ‌مبالات؛ لامەزەب›.

**لاابالی** / lā'ebālî, lā'obālî ، ـهـا/: [عربـی] *صفت.* خوێڕیلـە؛ هۆتـۆ؛ گەوەنـد؛ گەڤـەند؛ گـەللایی؛ ڕیخۆ؛ لاقەو؛ وێڵەکی؛ بێ‌سەر و بەر؛ سـەر و بـن دریا؛ بەرەڵلا؛ خەمسار؛ گوەفرە؛ گوێ‌نـەدەر بـە هـیچ داب و نـەریتێک ‹شـوهرش مـرد لاابـالی و بیکارەای بود: مێردەکەی پیـاوێکی خوێڕیلـەی هـیچ لێ‌نەهاتوو بوو›.

**لاابالیگری** / lā'ebālîgarî, lā'obālî- ، ـها/: [عربی/ فارسـی] *اسـم.* گـەللایی؛ بەرەڵـلایی؛ هۆتـۆیی؛ خوێڕیگەری؛ خوێڕیلەیی؛ بـێ‌سـەر و بەنگـەری؛ وێڵیەتی ‹جوانی‌اش به ولنگاری و لاابالیگری گذشت: لاوەتیەکەی بە کەمتەرخەمی و گەللاییەوە ڕابوارد›.

**لاادری** / lā'adrî/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* ١. لاپـرە؛ لاپۆرە؛ گەجە؛ گەچە؛ نەناس؛ نەشـناس؛ نـەدی ٢. ـون/ شوێنکەوتووی ڕێبازی نەزانیگەری.

**لاادریگری** / lā'adrîgarî/: [عربـی/ فارسـی] *اسم.* نەزانیگەری؛ باوڕ بـەوەی کـە زانـین و ناسـینی ڕاستەقینەی تەواو (وەک خودا) بۆ مرۆڤ نالوێ.

**لااقل** / lā'aqal(l)/: [عربی] *قید.* لانی‌کەم؛ بە لانی کەمـەوە؛ لای‌کـەم؛ لای‌کـەمی؛ هـیچ نـەبێ؛ لای‌خـوارێ ‹لااقـل کمـی اسـتراحت کـن، بعد بـرو: لانی‌کەم وچانێک بدە، جا بڕۆ›.

**لااله‌الاالله** / lā'elāha'ellallāh/: [عربـی] *دعـا.* خودایـەک بێجگـە «ئەڵـلا» نیـە (تێبـینی: ئـەم ڕستەیە یەکەمین کۆڵەکەی بڕوای دیـنی ئیسـلامە، بەڵام لە زاراوەی خەڵکدا بـۆ دەربـڕینی تـووڕەیی و ناڕەزایەتیش دەگوترێ).

**لائی** / lā'î/ ☜ **لایی**

**لائیک** / lā'îk/: [فرانسوی] *صفت.* *[سیاسی]* نادینی؛ نەریتی؛ لائیک؛ لاییک ‹حکومت لائیک: حوکمەتی نادینی›.

**لائیدن** / lā'îdan/ ☜ **لاییدن**

**لابد** / lābod/: [از عربی] *قید.* ۱. ناچار؛ بە ناچاری؛ ناچاری؛ هەڵبەت؛ ناعیلاج؛ چاری ناچار ‹لابد باید برود: ناچار دەبێ بچێ› ۲. ئەشێ؛ دەبێ؛ ڕەنگە؛ ڕەنگا؛ لاک؛ لە وانەیە؛ ویدەچێ؛ دەگونجێ؛ لەوە ئەچێ ‹لابد حالا رسیدەاند: ئەشێ ئێستا گەیشتبێتن›.

**لابراتوار** / lābrātuvār، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* تاقیگە؛ ئەزموونگە؛ ئازمایشگا؛ جێگایەک بە کەرەستەی پێویستەوە بۆ ئەنجامدانی ئەزموونی زانستی و پیشەیی.

**لابلای** / lābelāye/: *حرف.* لە نێوان؛ نێوان؛ لە نێو؛ دە نێوی؛ لە ناو؛ لە ناوی؛ لە نێوانی؛ لای؛ دلێو؛ دلێ؛ تۆی؛ بەین؛ بەینی؛ بەینوو ‹این را لابلای یادداشتها پیدا کردم: ئەمەم لە نێوان دەسنووسەکاندا دۆزیەوە›.

**لابه** / lābe، ـها/: *اسم.* *[ادبی]* ۱. لالە؛ پارە؛ کرووزە؛ کولوز؛ لاڤ؛ لاڤاهی؛ لافاهی؛ لاڤایی؛ لالکە؛ لاڤە؛ لاڤەلاڤ؛ لاڤەکی؛ لاوە؛ ڕاڤەر؛ شاکە؛ شاکەشاک؛ کارەکار؛ لالەوشفا؛ تکاولالە؛ تکاوخوایشت؛ مەهدەرڤانی؛ هەوەر؛ وەپار؛ سکالە؛ لالک؛ لالکە؛ داوا کردنی بە گریان و پارانەوە ‹آنقدر لابه کرد بخشیدم: هێندەی لالە کرد بەخشیم› ۲. *[قدیمی]* پەرێشانی؛ نیگەرانی ۳. *[قدیمی]* خاپ؛ فاک؛ لابان؛ بەن؛ هەنگ؛ لاس؛ گەڕ وگزی.

▣ **لابە کردن**: لالانەوە؛ لالیانەوە؛ پارانەوە؛ پاڕیانەوە؛ لوبانەدن؛ ناورانەوە؛ لالیایوە؛ ئەوەلالیەی؛ نەورانەوە؛ واڕیانەوە؛ ڤەپاڕیان؛ لەبیش؛ لەبیایش؛ راڤەراندن؛ سکالەکردن؛ لاڤا کردن.

**لابی** / lābî/: [انگلیسی] *اسم.* لابی: ۱. سەرسەرا (بەتایبەت هی هوتێل) ۲. *[سیاست]* تاقمی هاوپەیمان کە بە کارێکەوە خەریکن.

**لابیرنت** / lābîrant, lābîrent، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ۱. *[کالبدشناسی]* دالان؛ دالوو؛ پێکهاتەیەکی پێچاوپێچ لە ئەندامانی ناوەوەی جەستەدا، وەک هی گوێ و دڵ ۲. هەزارتۆ؛ دارەپیچان؛ هلۆل و ڕهۆل؛ دالان و بوارگەی پێچەڵپێچی سەرگیراو.

**لاپ** / lāp/: *اسم.* ۱. لاپ؛ هۆزی دانیشتووی باکووری ئیسکاندیناوی و ڕووسیا کە زۆرتر ڕانە بزنەکێویان هەیە یان ماسیگرن ۲. *ـها/* لاپ؛ هەر کام لە خەڵکی ئەو هۆزە ۳. لاپ؛ هەر یەکە لە زمانگەلی ئەو هۆزە، لە لقی زوانەکانی فینووئویغووری ٤. *[گفتاری]* گەڕ؛ گزی؛ گەژ؛ کار یان ڕەوتی سەر بادانەوە و لادان لە بەڵێن.

▣ **لاپ آمدن**: ۱. هەڵشلنگاندن؛ گزی/ گەڕ کردن ۲. حاشای قەرز و سەر بادان لە دانەوەی.

**لاپوست** / lāpûst/ ☜ **زیرپوست**

**لاپوشانی** / lāpûšānî/: *اسم.* *[گفتاری]* کار یان ڕەوتی پەرۆکردن؛ هەوڵ بۆ شاردنەوەی شتێکی ناخۆش، بەتایبەت بە فێڵ و گت ‹تو که همه چیز را به آزاد گفتی حالا چرا لاپوشانی می‌کنی؟: تۆ خۆ هەموو شتێکت بە ئازاد گوت ئێستە بۆ پەروی دەکەی›. هەروەها: **لاپوشانی کردن**

**لاپه** / lāpe، ـها/: *اسم.* ۱. تاشە؛ تاش؛ کۆتەرە دارێ کە بە باری درێژاییدا برابێت ۲. قاژ؛ قاژە؛ قاش؛ خاش؛ قڕاش؛ کووز؛ کووزە؛ کویز؛ کووزیە؛ کیز؛ لاهۆرە؛ تیلم؛ باریکەیەکی دابڕاو لە شتێک.

▣ **لاپە کردن**: دار بە باری درێژیدا برین.

**لات** / lāt، ـها/: *صفت.* لات: ۱. خوێڕی؛ خۆڕی؛ وێڵ؛ بەڕەلا؛ وێڵەکی؛ گەلاج؛ گەلاچ؛ شەلاتی؛ شەلات؛ گەمۆڕ؛ گەلۆڕ؛ کەلۆڕ؛ لەگام؛ ڕێخۆ ‹با این آدم لات نگرد!: لە گەڵ ئەم خوێریە مەبە!› ۲. *[کنایی]* ڕووتەڵ؛ ڕووت؛ ڕووتە؛ ڕەجاڵ؛ دەسکورت؛ زۆر هەژار و نەدار ‹می‌خواهی زن این

لات آسمان‌جل بشوی؟!: دەتەوێ ببیتە ژنی ئەم ڕووتەلە بێ‌ئەنوایە؟!›.

**لاتار** / lātār/: [از انگلیسی] ☜ **لاتاری**

**لاتاری** / lātārî ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. لاتاری؛ بەخت ئەزمەیی: **لاتار؛ لاطار؛ لاطاری**

**لات‌بازی** / lātbāzî ، ـها/:/اسم. شەلاتی؛ شەللاتی؛ لات‌بازی؛ لاتی؛ بەڕەلایی؛ خوێڕیگەری؛ ئاکاری نەگونجاوی دژ بە قانوون کە ببێتە هۆی بشێوە ‹مسابقەی فوتبال شد میدان لات‌بازی: کێبەرکێی فووتبال بوو بە مەیدانی شەلاتی›.

**لاتکس** / lāteks/: [انگلیسی] شیرەک؛ شیلە؛ شیلاوگە؛ شیلاوە؛ لاتێکس؛ جۆرێ جەویە لە ناو لاسک و میوەی برێ دار و ڕوەکدا، وەک چەسپ و بۆ دروستکردنی دەسکێشی برینگەری و زۆر شتی‌تر بە کار دەچێ.

**لات و پات** / lāt-o-pāt ، ـها/: صفت. [گفتاری] لووت و پووت؛ ڕووت و ڕەجاڵ؛ ئاس و پەلاس؛ لاپۆتی؛ ڕووتە و پووتە؛ هەژاری سەر ساجی عەلی.

**لات و لوت** / lāt-o-lût ، ـها/:/اسم. خوت و خوێری؛ خۆڕی و تۆڕی؛ گەجەرگوجەر؛ عەلۆجەلۆ؛ لۆتن و پۆتن؛ لات و شەلات؛ گەچەڵ و گوچەڵ؛ هیچ و پووچ؛ لات و لووت؛ خەڵکی بەتاڵ، ڕووت و ڕەجاڵ، بێ‌ناوبانگ و بێ‌جێ و ڕێ ‹یک مشت لات و لوت ریختند و جشن را بە هم زدند: هێندێک خوت و خوێری ملیان نا و جێژنەکەیان تێکدا›.

**لاتی** / lātî/: صفت. لاتی؛ گەلاجی؛ گەڤەندی؛ سەر بە لات ‹لهجەی لاتی، رفتار لاتی: زاراوەی لاتی، کردەوەی گەلاجی›.

**لاتین** / lātîn/: [فرانسوی] ☜ **لاتینی**

**لاتینی** / lātînî/: [فرانسوی]/اسم. لاتینی: ١. گرنگ‌ترین زمان لە لقی ئیتالیک، لە زوانگەلی هیندو- ئورووپایی، زمانی زانستی و فەرهەنگی ئورووپای ڕۆژاوا تا برانەوەی چەرخی حەڤدەی زاینی ٢. لقێکی گەورە و گرینگ لە زمانگەلی ئورووپایی ئەورۆ بریتی لە: فەڕانسەوی، ئیتالیایی، سپانیۆل، پورتغالی و ... ٣. زمانی کەونارای رووم (ئیتالیای ئێستاکە) ٤. خط لاتینی ☜ **خط * لاتین**

**لاجرعە** / lācor'e/: [از عربی]قید. یەک‌بین؛ یەک‌نەفەس؛ یەک‌قوم؛ یەک‌دەم؛ یەک‌هەناسە؛ بە قومێک؛ یەک وچان؛ یەک پیش؛ ڕەوتی نانە سەرەوە و بە یەکجار خواردنەوە ‹شیشە را لاجرعە سرکشید: شووشەکەی یەک بین هەڵقۆڕی›.

◘ **لاجرعە سرکشیدن**: نانە سەرەوە؛ هەڵقۆڕاندن؛ هەڵقوڕان؛ یەکجێ وەخواردن؛ ورماشەنە؛ خواردنەوەی بێ‌ڕاوەستان؛ یەک قوم خواردنەوە؛ هەڵنۆشین؛ یەکەی بین واردەی؛ یەک‌جێ و بێ‌ڕاوەستان خواردنەوە.

**لاجرم** / lācaram/: [عربی]قید. [ادبی] ١. لە ناچاری؛ بە ناچار؛ ناعیلاجی؛ چاری ناچار؛ چارناچاری ٢. دەرەنجام؛ سەرەنجام؛ ئاخری؛ دواخری؛ لە ئاکامدا.

**لاجورد** / lāc(e)vard/:/اسم. لاجەوەرد: ١. ماکێکی شینی تۆخ کە لە شیلەی گیا یان بە شێوەی کیمیایی بەرهەم دێت ٢. ماکێکی شین کە لە سوانی بەردی لاجیوەرد و پرتووکانی کانیەکانی دروست دەبێ.

**لاجوردی**[1] / lāc(e)vardî/:/اسم. لاجوەردی؛ ڕەنگی کەوەی ئاسمانی.

**لاجوردی**[2]: صفت. لاجوەردی؛ بەڕەنگی لاجوەرد؛ بە ڕەنگی شینی ئاسمان.

**لاجون** / lācûn/: [عربی/ فارسی] صفت. [مجازی، گفتاری] ١. بێ‌گیان؛ سیسە؛ سیسۆڵ؛ سیسەڵە؛ فیسقەل؛ لەڕلاواز؛ ڕەق و ڕەواڵ؛ ڕەق و تەق؛ ڕەق و فێق؛ ڕێق و فێق؛ ڕەقەڵە؛ قرخ؛ قرخۆڵ؛ قرخۆلە؛ ڕێقن؛ ڕێخن؛ ڕیوەڵ؛ ڕیوەڵە؛ ڕێقنە؛ ڕێقۆ؛ ڕێقۆڵە؛ قاریت؛ قەڵستۆک؛ مەڕمووکە؛

ویسک؛ بەکلکێ؛ دارکەپێچان؛ گەرکە؛ گـەرک؛ کەلەخ؛ خلۆپە؛ هۆپل؛ کۆپل؛ چیقاڵ؛ چەلقوو؛ قارقارۆک؛ قاپچووک؛ قارپچووک؛ قرچەڵۆک (بۆ ژن)؛ کز و لاواز ٢. نەبەگە؛ کـەم‌گیان؛ مـردۆخ؛ مردۆخ؛ لەق؛ شل و شەوێق.

**لاحق** / lāheq/: [عربی] *صفت*. دوایی؛ دمـەین. بەرانبەر: **سابق** ‹نه شهردار سابق کاری کرد و نه شهردار لاحق: نه شارەداری پێشوو کارێکی کرد و نه ئەمی دوایی›.

**لاخ**[1] / lāx/ ☜ **لاخه**

**ـ لاخ**[2]: *پسوند*. ـەڵان؛ ـ لان؛ ـ انی؛ ـ لاخ؛ ـ ناخ؛ کۆگای شتی ناخۆش یان نالەبار ‹دیولاخ؛ سنگلاخ: حووچەڵان؛ بەردەڵان›.

**لاخه** / lāxe/: *اسم. [گفتاری]* تیسماڵ؛ تیزماڵک؛ تیسماڵک؛ تیلماسک؛ ڕاژە؛ شتێ درێژکاری باریکەڵە: **لاخ**[1]

**لاد** / lād/: *اسم. [قدیمی]* ١. هیم؛ بنەڕەت؛ بنـەما ٢. [از کردی] کاد؛ قاد؛ قات؛ قاج؛ زەوی؛ زەویـن؛ هەرد؛ ئاخ؛ خاک ٣. دیوار؛ تیکار؛ تاک؛ کۆسـەر ٤. لا؛ چین.

**لادن** / lādan ، ـها/: [از لاتینی] *اسم*. لادەن؛ موورگەگوڵ: ١. گیایەکی کوڵ یان پێچ‌پێچ لـە تیرەی خەنـە، تایبـەتی ناوچـەی گـەرمێن، بـە گەڵای پان و گوڵـی ساکارەوە ٢. گوڵـی ئـەو گیایە کە بە ڕەنگی زەرد، سوور یان نارنجیـە و بۆ جوانی دەیکێڵن.

**لادین** / lādîn ، ـها/: [از عربی] *صفت. [گفتاری]* بـێ‌دیـن؛ لامەسـەو؛ لامـەزەو؛ خوانـەناس؛ خوانەپەرەس (جۆرێ جنێوە).

**لارژ** / lārj/: [فرانسوی] *صفت*. لارژ؛ لارج: ١. *[مجازی]* دەستندە؛ دەس‌بڵاو ‹آدم لارژ: مـرۆی دەسـتندە› ٢. گـەورە؛ زل (لەمـەڕ پۆشـاکەوە) ‹پیراهن لارژ: کراسی گەورە›.

**لارگو** / lārgo ، ـها/: [؟] *اسم. [موسیقی]* ئاهـەنگی زۆر ئـارام؛ پـاژە ئاهـەنگێ کـە زۆر بـە کـاوەخۆ بەڕێوە دەچێ.

**لارنژیت** / lāranjît, lārenjît/: [فرانسوی] *اسم. [پزشکی]* لارنژیت؛ نەخۆشی سـوور هەڵـگەڕان و ئاییسانی بەشی دەنگسازی قوڕگ.

**لارو** / lārv ، ـها/: [فرانسوی] *اسم. [زیست‌شناسی]* تەتڵەمیوە؛ مێتوولکە؛ مێرووک؛ کرمە؛ کرمـەک؛ کرمینـە؛ بەچکـەی نـەگووراوی بـڕێ گیانـەوەر (وەک مێروو) کە پاش دەرهاتن لە گەرا و تێپـەڕ کـردنی ماوەیـەکی دیـاریکراو، پـێ‌دەگـا (وەک کرمی هەورێشم): **کرمینه**

**لاروب** / lārûb ، ـهـا/: *صـفت*. کووسماڵـە؛ تەخت‌ماڵێن ‹کشتی لاروب: گەمیەی کووسماڵە›.

**لاروبی** / lārûbî/: *اسم*. کووسمـاڵ؛ کووزمـاڵ؛ جۆڵ‌ماڵ؛ جۆماڵ؛ جۆگەماڵی؛ تەخت‌ماڵی؛ کار و ڕەوتی ڕامالـین و خـاوێن‌کردنـەوەی تـەختی جۆگە یان هەماراو لە لمت و لیتەی بنی ‹وقتی جوی کنار خیابان را لاروبی می‌کنند چه بوی گندی می‌دهد: کاتێ جۆگـەی قـەراخی شـەقام کووسماڵ دەکەن چ بۆگەنێکە›: **لایروبی**

**لازانیا** / lāzān(i)yā/: [ایتالیایی] *اسم*. لازانیـا: ١. ماکێک خواردەمەنی بە شێوەی پەڕەگەلێک لە ماکارۆنی ٢. لێنراوی لازانیا بە سوسی تەماتە، پەنیر و گۆشتەوە.

**لازم** / lāzem/: [عربی] *صفت*. ١. پێویسـت؛ پێویس؛ پێداویست؛ پێویسـتی؛ لەسـەر؛ زەروور؛ تـەوزی ‹کـار لازم؛ دستور لازم؛ پـول لازم: کـاری پێویست؛ دەسـتووری پێویس؛ پـارەی پێویسـتی› ٢. *[دستور]* ☜ فعل لازم، **فعل**

▣ لازم آمدن: پێویست بوون؛ پێداویست بوون؛ گەرەک بوون ‹لازم آمد که خودت بروی: پێویستە خۆت بڕۆی›.

لازم بـودن: پێویسـت بـوون؛ ئەوەجـە بـوون؛ ئەوەجێی بوون؛ نیاز بوون ‹لازم بود بـه او تـذکر داده شود: پێویست بوو کە بە گوێیدا بدرێتەوە›.

لازم داشتن: گەرەک بـوون؛ پێویسـت بـوون؛

هەرەک بوون ‹قدری پول لازم داشتم تا لباس بخرم: هێندێک پارەم گەرەک بوو هەتا جل و بەرگ بکرم›.

لازم دانستن/ دیدن/ شمردن: پێ‌باش بوون؛ (بە) پێویست زانین؛ ئەوەجە زانین ‹لازم دانستم قدری پول برایت بفرستم: پێویستم زانی هێندێک پارەت بۆ بنێرم›.

لازم نکردن: *[گفتاری]* پێویست نەبوون؛ گەرەک نەبوون؛ ئەوەجە نەکردن؛ ئەوەجە نەبوون؛ لازم نەکردن (تێبینی: بۆ دەربڕینی پێ ناخۆش بوون دەگوترێ) ‹لازم نکرد به اینجا بیایی: پێویست نەبوو بیت بۆ ئێرە›.

**لازم‌الاجــرا** / lāzemol'ecrā/: [عربی] *صفت.* پێویست بۆ بەڕێوە بردن.

**لازمــه** / lāzeme ، ـها؛ لوازم/: [عربی] *اسم.* پێداویست؛ پێویستی؛ پێویسی؛ ئەوەجەیی؛ وەجەیی؛ ئەوەی کە هەبوونی بۆ شتێ یان بەدیهاتنی دۆخێ پێویست بێ ‹لازمەی این کار داشتن سرمایەی زیادی است: پێداویستی ئەمکارە هەبوونی سەرمایەیەکی زۆرە›.

**لازولیت** / lāzûlît/: *اسم. [زمین‌شناسی]* لازوولیت؛ بلۆری ئاوداری فوسفاتی ئالومنیۆم، بە ڕێژەی جۆراوجۆری ئاسن و مەنیەزیۆم بە ڕەنگی ئاوی لاجوەردیەوە کە وەکوو سەنگی ڕازێنەر بەکاری دەبەن.

**لاس** / lās/: *اسم.* ۱. هەورێشمی خوێڕیلە ۲. مۆز؛ کار و ڕەوتی پێکەوە دوان و یەکتر لاواندنەوە بۆ حەزی جینسی ۳. *[مجازی]* یەکتر دواندنی بە درۆ.

◘ لاس زدن: مۆز/ مۆزەمۆز کردن.

**لاستیک** / lāstîk ، ـها/: [از فرانسوی] *اسم.* لاستیک؛ لاسیک: ۱. جیل؛ جیر؛ هەر شتێکی سروشتی یان دەسکردی کێشسان (وەک تەگەرەی ماشین، کێش و...) ۲. تەگەرە؛ چەرخ ‹لاستیک عقب پنچر است: تەگەرەی پاشەوە پەنچەرە›.

**لاستیکی** / lāstîkî/: [از فرانسوی] *صفت.* لاستیکی؛ لاسیکی؛ چێ‌کراو لە لاستیک ‹کفش لاستیکی، توپ لاستیکی: کەوشی لاستیکی، تۆپی لاسیکی›.

**لاسیدن** / lāsîdan/: *مصدر. متعدی.* ۱. *[گفتاری، تعریض]* مۆزکردن بۆ حەزی جینسی ۲. *[مجازی]* زمانبازی‌کردن؛ دواندنی بە درۆ بۆ فریو دان ۳. *[مجازی]* بۆ خۆشی و خۆ خلافاندن بە شتێکەوە خەریک بوون. هەروەها: **لاسیدنی**

**لاش** / lāš ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* کەلاک؛ لاک؛ لاشە؛ لاش؛ جەسە؛ جەستە.

**لاشبرگ** / lāšbarg ، ـها/: *اسم.* چینی ڕەشی سەرخاک کە لە داڕزانی چڵ و چێو و گەڵاوە بەرهەم هاتووە.

**لاشخور**[1] / lāšxor ، ـها؛ ـان/: *اسم.* هولیلک؛ خەرتەل؛ خرتەل؛ خەرتل؛ خەردال؛ ورخال؛ قەرتال؛ دال؛ دالاش؛ داراش؛ سوورەدال؛ لەشخۆر؛ لاشخۆر؛ لاشەخۆرە؛ کەرخوەر؛ دالەکەرخوەرە؛ پەلەوەرێکی گەورەی باڵ پان و جووچک کورتە کە نێر و مێوینەیان وەک یەکن و گۆشتی کەلاکی گیانەوەرانی‌تر دەخۆن: **کرکس**

**لاشخور**[2] / ـها/: *صفت.* لاشخۆر؛ لەشخۆر؛ دالاش؛ مردارخۆر؛ هۆگر بە خواردنی کەلاک.

**لاشه** / lāše ، ـها/: *اسم.* لاشە: ۱. لاش؛ لەش؛ کەلاک؛ لاک؛ کەلاش؛ کەلەش؛ تەرم؛ بەراتە؛ بەلاتە؛ جەندەک؛ مردال؛ مردار؛ مرداری؛ کەلەخ؛ جەستەی گیاندار، بەتایبەت گیانەوەری مردوو ‹لاشەی یک سگ مرده افتاده بود کنار خیابان: کەلاکی سەگە تۆپیوێک لە قەراخ شەقامەکەدا کەوتبوو› ۲. *[مجازی]* لەتە؛ بەڵگەی ئابووری بەتاڵەوکراو، بڕ نەماو یان پەرداخت‌کراو ‹لاشەی سفته‌ها را از بانک پس بگیر: لەتەی سفتەکان لە بانک وەرگرەوە›.

**لاشی** / lāšî/: *صفت. [گفتاری]* لاکەوتە؛ پاژینە؛ بن پاژینە؛ کەم بایەخ و شیاوی فڕێ دان.

**لاشیدن** / lāšîdan/: *مصدر. متعدی. [قدیمی]* شەلاندن؛ تالان‌کردن؛ بە تالان بردن.
**لاطار** / lātār/: [از انگلیسی] ☜ **لاتاری**
**لاطاری** / lātārî/: [از انگلیسی] ☜ **لاتاری**
**لاطائل** / lātā'el/: [عربی] ☜ **لاطایل**
**لاطایل** / lātāyel ، ـات/: [عربی] *صفت.* شرم ـ برم؛ گیوەگیو؛ گیژەگیژ؛ هیچانە؛ کەترەیی؛ بێبایەخ (لەمەڕ قسەوە) ‹چرا باید به این لاطایل گوش بدهم؟: بۆ دەبێ گوێ بۆ ئەم شرم ـ برمانە شل بکەم؟›: **لاطائل**
**لاعلاج**[1] / lā'alāc, -'elāc/: [عربی] *صفت.* بێدەرمان؛ بێچارەسەر ‹بیماری لاعلاج: نەخۆشینی بێدەرمان›. هەروەها: **لاعلاج بودن؛ لاعلاج ماندن**
**لاعلاج**[2]: *قید.* بە ناچار؛ ناچار؛ دەستەوسان؛ دەستەوستان؛ ناعیلاج؛ چارناچاری ‹لاعلاج بردم قالی را فروختم: ناچار قالیەکەم برد و فرۆتم›.
**لاعلاجی** / lā'alācî,-'elācî/: [عربی] *اسم. [گفتاری]* بە ناچاری؛ ناچاری؛ چاری‌ناچار؛ چارناچاری ‹لاعلاجی آمده در شهر عملگی می‌کند: بە ناچاری هاتۆتە شار کرێکاری دەکا›.
**لاغر** / lāqar ، ـها/: *صفت.* لەڕ؛ لاڕ؛ لار؛ لاواز؛ لەڤاز؛ لەواز: ۱. دالگۆشت؛ چەقەڵ؛ لەجەر؛ گەجەر؛ گوجەر؛ لەغەر؛ ڕەقەڵ؛ ڕەقاڵ؛ سێخنە؛ زیقن؛ مەرەزار؛ مەرووز؛ قیق؛ چەرمە؛ چەنجووز؛ چرچە؛ چیقاڵ؛ جیقن؛ جووقن؛ کەلاخ؛ رینک؛ مێسیل؛ مسری؛ پووتەکە؛ وەزا؛ کز؛ مردەملاس؛ ڕەق و ڕەواڵ؛ بەبێ گۆشت و چەوری ‹مرغ لاغر: مریشکی لاواز› ۲. ناسک و تەنکەڵە؛ کەم‌گیان؛ باریک؛ ناسک و کەم ئەستوور ‹ستون لاغر: کۆڵەکەی ناسک›.
▣ لاغر شدن: لاواز بوون؛ لەڕ بوون؛ ڤەمرتن؛ ڤرچقین؛ ڕەق هەلاتن؛ قیپ بوون؛ هەژار بیەی. هەروەها: **لاغر بودن؛ لاغر کردن**
**لاغری** / lāqarî/: *اسم.* لەڕی؛ کوللەکی؛ لەجەری؛ لاوازی؛ لاڕی؛ کزی؛ دالگۆشتی؛ مەرەزاری؛ لەرزی؛ بێ گۆشتی؛ چرچی؛ بنێسی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لاواز بوون ‹از لاغری مثل چوب خشک شده بود: لە لەڕیدا وەک چیلکە وشک هەلاتبوو›.
**لاغیر** / lāqeyr/: [عربی] *قید.* هیچ تر؛ هیچی تر؛ هیچێ‌تر؛ نەچتێ‌تر؛ هیچێوتیر؛ تەواو ‹همین است و لاغیر: هەرئەمەیە و هیچ‌تر›.
**لاف** / lāf ، ـها/: *اسم.* گەف؛ هاشە؛ بافیش؛ زرت؛ زڕ؛ فڕ؛ قونەت؛ قومپوز؛ هوول؛ هوشە؛ لاف؛ لامی‌جیم؛ شات و شووت؛ هاش و هووش؛ چاپ و چوپ؛ چاخان و پاخان؛ هەیت و هوت؛ گڕ و فڕ؛ فیشاڵ؛ چیف؛ پنج و مۆڕ؛ هەلات؛ چاوڕاو؛ کاری خۆ هەڵکێشان و پەسنی خۆدان.
▣ لاف زدن: خۆ هەڵکێشان؛ خۆ هەڵدان؛ چاپ کردن؛ لاف لێدان؛ چاپلێدان؛ ناڤ لخۆدان؛ دداندن؛ هەڵشلنگاندن؛ هەڵشلینگاندن؛ وێ هۆرکێشتەی؛ پنج و مۆڕ/ مورک لە خۆ نان؛ پەسنی خۆ دان؛ بە خۆدا هەڵگوتن.
**لافزن** / lāfzan ، ـها/: *صفت.* هوولباف؛ تەوتەوە؛ دەڤتەژی؛ قۆپز؛ خۆهەڵکێش؛ زڕجان؛ زڕتۆک؛ بە چاو و ڕاو؛ چاو و ڕاوکەر؛ پارچەچی؛ بافیشکەر؛ فیشاڵکەر؛ فیشاڵباز؛ فیشاڵچی؛ چاپچی؛ ترتری؛ لافلێدەر؛ وێ هۆرکێش؛ بە خۆدا هەڵبێژ. هەروەها: **لافزنی**
**لافیدن**/ lāfîdan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* // **لافیدی:** هەڵتشلنگاند؛ **می‌لافی:** هەڵدەشلنگێنی؛ **بلاف:** هەڵشلنگێنە// هەڵشلنگاندن؛ هەڵشلینگاندن؛ هەڵشنگاندن؛ دداندن؛ لاف لێدان؛ بە خۆدا هەڵگوتن و لە پووچەڵ هەڵبەزین.
■ مصدر منفی: **نلافیدن** (هەڵنەشلنگاندن)
**لاقید** / lāqeyd ، ـها/: [از عربی] *صفت. [گفتاری]* لامل؛ بێبار؛ گەللایی؛ کەللەیی؛ کەترە؛ گوێ‌نەدەر؛ خاوێر؛ حولحولی؛ کەمتەرخەم؛ کەترەخەم؛ بەرەلا؛ بەرەڵدا؛ قەفال؛ ڕەها؛ بەبێ ورد بوونەوە و پشتگری لە کاردا ‹تو که این‌قدر به

سر و ریخت خودت توجه می‌کنی، چطور نسبت به کارت لاقید هستی؟: تۆ کە هێندە بە خۆتەوە خەریکی، ئەی چۆنە بۆ کارەکەت لاملی؟›.

**لاقیدی** / lāqeydî ، ـها/: [از عربی]/اسم. *[گفتاری]* بێبـاری؛ کـەترەیی؛ لاملـی؛ حولحـولیبـازی؛ کەمتەرخەمی؛ خاویری؛ قەفالی ‹وقتی به مهمانت احترام نمی‌گذاری این لاقیدی است: کاتێ بـۆ میوانـت ڕێز دانانی ئەمە ئیتر بێباریە›.

**لاک** / lāk/:/اسم. لاک: ١. *[جانورشناسی]* قـاپ؛ قاپلۆخ؛ قابلۆخ؛ قالۆ؛ کەلـەخ؛ قـاپۆرە؛ ئەسـپەرە یان پۆشەنێکی ڕەق لە ئێسک یـان کیـتین کـە تەواو یان بەشێک لە پشتی گیانەوەر دادەپۆشێ (وەک قاپی کیسەڵ) ٢. ماکێکی جەوی سوور کە لە مێرووی تاکاردیالاکاوە دەدەڵێ و بۆ بەرهـەم هێنانی لاک و ئەلکول بە کەڵک دێت ٣. مـاکی ڕازاندنەوەی نینۆک کە وەک تراوێکی ڕوون یان ڕەنگامە لە نینۆکی دەسوون ٤. تراوێکـی سـپی بۆ کۆژاندنەوەی هەڵەی نووسراوە.

◘ **لاک الکل** ☜ **لاک‌والکل**

**لاک مهر** ☜ **لاک و مهر**

◘ **توی لاک خود بودن**: *[مجازی]* ١. سـەر لـە کەلـەخی خـۆ نـەجوولانن؛ دووچـاری بـیر و خەیاڵی خۆ بوون ٢. سەر لە ناو کاولی خـۆدا بوون؛ دوورەپەرێزی‌کردن.

**لاکپشـت** / lākpošt ، ـها؛ ـان/:/اسم. کیسـەڵ؛ کاسەپشـت؛ کیسەڵـی؛ کووسـەڵ؛ کوویسـەڵ؛ کووسەلە؛ کیسۆ؛ کسل؛ کیسی؛ سیلە؛ کین‌فس؛ کێسوو؛ کووسی؛ کەوسەڵ؛ کێسو؛ گیانەوەرێکی خزۆکی قاپێلک ڕەقە، لەشێکی پانی هەیە و زۆر لەسەرەخۆ دەڕوا، زستانان لە بن خاکا دەخەوێ و لە بەژ و وشکانیدا دەژی.

◘ **لاکپشت خاکزی**: کیسەڵ؛ کەوسـەڵ؛ کسـل؛ کێسوو؛ کین‌فـس؛ کووسـەڵ؛ سـیلە؛ جـۆرێ کیسەڵە کە لە وشکانی دەژی و گیاخۆرە.

**لاکپشت دریایی**: ڕەقە؛ ڕەق؛ جۆرێ کیسەڵـی ئاوژیـە بـە پـای وەک پـاڕۆ و قـاپی پتـەو و ئەستوورەوە، زۆر گەورە دەبێ، مەلەوانی چاکە و بۆ هێلکەکردن دێتە قەراخی ئاو.

**لاکپشت سبز**: زلەکیسەڵ؛ ڕەقەکیسەڵ؛ ڕەقیاو؛ جۆرێک کیسەڵی قورس و گەورەی دەریاژیە.

**لاکتاب** / lāketāb ، ـها/: [عربی] صفت. *[گفتاری]* لامـەزەو؛ لامەسـەو؛ بـێدیـن؛ خوانـەناس؛ خوانەپـەرەس؛ بـێبـاوەڕ بـە کتـێبی ئاسمـانی (جۆرێ جنێوە).

**لاکتاز** / lāktāz/: [فرانسوی]/اسم. *[شیمی]* لاکتـاز؛ ئانزیمی گەدەی گوانـداران کـە لاکتـۆز دەکاتـە دکستڕۆز و گالاکتۆز.

**لاکتوز** / lāktoz/: [فرانسوی]/اسم. *[شیمی]* لاکتـۆز؛ شەکری شیر؛ جۆری شـەکرە لـە شـیردایە، لـە ئـاودا نـەختێک دەتوێتـەوە، لـە دەواسـازی، بژیشکی و پیشەسازیدا بە کار دێ.

**لاکردار** / lākerdār ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. *[گفتـاری]* نـادرووس؛ جانقولیبـاز؛ ناکڵـۆکار؛ بـەدکردار؛ بـە ئاکـار و کـردەوەی دزێـو و ناشیرینەوە (بۆ جنێو دەیڵێن).

**لاک‌گیـری** / lākgîrî/:/اسم. لاک‌گـری؛ کـاری کۆژاندنەوەی هەڵەی نووسراو بە تۆژێـک لاکـی سپی.

**لاکن** / lāken/: [عربی] ☜ **لکن**

**لاک و الکل** / lāk-o-'alkol/: [فارسی/ فرانسوی از عربـی]/اسم. لاک و ئـەلکول؛ تێکـەڵاوی لاک و ئەلکولی پیشەسازی کە لە ڕەنگساوی چێودا بـە کار دێت.

**لاک و مهر** / lāk-o-mohr/:/اسم. لـۆک؛ لاک و مۆر؛ لاکی بە مۆر شەقڵ‌کراو.

◘ **لاک و مهر کردن**: لۆک‌کردن؛ سـەرمۆرکردن؛ لاک و مۆرکردن؛ داخستنی دەرکـی شـتێک (زیاتر پاکەت) بە لاک و مۆر بۆ دڵنیا بوون لـە نەکرانەوەی.

**لاکی**[1] / lākî/:/اسم. لۆکی؛ لاکی؛ ڕەنگی سووری

ئەرخەوانی تۆخ.

**لاکی**[۲]: *صفت.* لاکی؛ لۆکی؛ بە ڕەنگی سووری ئەرخەوانی تۆخ. هەروەها: **لاکیڕەنگ**

**لال**[۱] / lāl ، ـها/: *اسم.* لاڵ؛ لاڵ؛ لاڵ؛ بێزوان؛ کەسێ کە بە هۆی گرفتی زنەوایی و ویژاییەوە نەتوانێ قسە بکا.

**لال**[۲]: *صفت.* لاڵ؛ لاڵ؛ لاڵ؛ بەبێ توانایی قسە کردن.

**لالا** / lālā/: *اسم. [کودکانه]* لالا؛ ئەللا؛ خەو.

◘ **لالا کردن:** لالاکردن؛ لالا کەردەی؛ ئەللا کردن؛ خەوتن؛ نووستن؛ خەفتن.

**لالائی** / lālā'î/ ☜ **لالایی**

**لالایی** / lālāyî ، ـها/: *اسم.* لایەلایە؛ لایلایە؛ لالایی؛ لای‌لایی؛ لای‌لای؛ لایی‌لایی؛ لاوەلاوە؛ دەلالێ؛ لۆر؛ لۆری؛ لۆرک؛ گۆرانی بۆ دەخەو کردنی زارۆک ‹آوای نرم مادری شنیده می‌شد که داشت برای بچه‌اش لالایی می‌خواند: دەنگی نەرمی دایکێ دەهات کە خەریک بوو بۆ منداڵەکەی لایەلایەی دەکرد›: **لالائی**

◘ **لالایی خواندن:** لایەلایەکردن؛ لای‌لایەکردن؛ لای‌لاییکردن؛ لۆراندن؛ لوورکنایش؛ لەی‌لەی‌کەردەی.

**لال بازی** / lālbāzî ، ـها/: *اسم.* لاڵەموونی؛ کار یان ڕەوتی گەیاندنی مەبەستی خۆ بە ئاماژەی دەست و سەر و چاو ‹زبان آنجا را نمی‌دانستیم و مجبور بودیم با لال‌بازی مقصودمان را بفهمانیم: زمانی ئەوێمان نەدەزانی و دەبوو بە لاڵەموونی مەبەستمان تێبگەیێنین›.

**لالکی** / lālakî ، ـها/: *اسم.* دارێکی دڕکاوی بە گوڵی بۆنخۆش، میوەی سووری خورمایی و شیرینەوە: **لیلَکی**

**لالمانی** / lālmānî/: *اسم. [تعریض، گفتاری]* لاڵی؛ لاڵی.

◘ **لالمانی گرفتن:** لاڵ بوون؛ زوان بەستن ‹مگر لالمانی گرفته بودی؟ چرا چیزی نگفتی؟: مەگین لاڵ ببووی؟ بۆ هیچت نەگوت؟›.

**لاله** / lāle ، ـها/: *اسم.* ۱. هەلالە؛ هەرالە؛ لوولیک ئاگرۆ؛ ڕەبەنۆک؛ بووک؛ گوڵاڵە؛ بابینۆک؛ پاگورگانە؛ پاگوریانە؛ گیایەکی ئالفی سەلکدارە بە گەڵای درێژ و داشکاوی سەوز، گوڵی تەواو و جامی زەرد یان سوورەوە ۲. گوڵەمێلاقە؛ گوڵاڵە سوورە؛ گوڵەنیسان؛ گولیکا نیسان؛ گوڵەبووک؛ گوڵی ئەو گیایە ۳. لالە؛ لەعلە؛ لالا؛ مەردەنگی؛ شەمدانی شووشە لە سەر کە شەمێکی تێدا دەسووتێ.

◘ **لالەی درختی:** دارێکی خەزەڵوەری جوان لە تیرەی ماگنولی بە گوڵی زەرد یان نارنجییەوە.

**لالەی دریایی** ☜ **لالەوش**

**لالەی گوش:** ۱. گوێ؛ پەلی‌گوێ؛ چینچک؛ چیچیلە؛ چیچڵە؛ بەگوشک؛ بەشی دەرەوەی ئەندامی ژنەوایی گوانداران بۆ کۆ کردنەوەی دەنگ ۲. دالانی دەرەکی گوێ.

**لالەزار** / lālezār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* لالەزار؛ هەرالەجاڕ؛ گوڵجاڕ؛ گوڵاڵەجاڕ؛ دەشتێ کە گوڵەنیسانی زۆری تێدا ڕواوە و سوور دەکاتەوە.

**لالەعباسی** / lāle'abbāsî ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* لالەباس؛ لالەعەباسی؛ لالەباسی؛ لالۆباسی؛ لالەباشی؛ خەوەردۆس؛ گیایەکی ئالفی و ڕازینەیی بە سەلکی قەڵەو، گەڵای درێژۆکەی لێوارە گرنج و گوڵی جوان و بۆنخۆشی سوور، سپی یان زەردەوە کە لە خۆراوا بووندا دەکرێتەوە.

**لالەگون** / lālegûn/: *صفت.* لالەواش؛ لالەئاسا؛ بە ڕەنگی سووری بریکەدار.

**لالەوش** / lālevaš/: *اسم.* لالەی دەریایی؛ گیانداری دەریاژی ڕەق پێست بە لەشی سووری مەیلەو نارنجی و بیچمی وەک گوڵەوە: **لالەی دریایی**

**لالی** / lālî/: *اسم.* لاڵی؛ لاڵی؛ لالەکی؛ بێزوانی؛

بار و دۆخی لاڵ بوون.

**لام** / lām/: اسم. لام: ۱. [عربی] نێوی عەرەبی بیست و حەوتەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی ۲. [؟] لەتە شیشەیەکی بە ئەندازەی ۷۵×۲۵ میلی‌میتر و ئەستووری ۱-۲ میلی‌میتر بۆ لە سەر دانانی نموونەی گیاندارانی وردیلە یان قاشی گیایی و گیانەوەری و خستنە ژێر میکرۆسکۆپ ۳. لەتە شیشە و نموونەکەی سەری پێکەوە.

▣ **لام تا کام حرف نزدن**: ئەلف تا بێ هیچ نەگوتن/ قسە نەکردن؛ لام و جیم نەکردن؛ نق نەکردن؛ لێو نەترەکانەوە؛ دەم نەکردنەوە؛ لەبز نەبزواندن ‹هرچه گفتم لام تا کام حرف نزد و همین‌طور مرا نگاه می‌کرد: هەرچێکم گوت، ئەلف تا بێ هیچی نەگوت و هەروا تەماشای دەکردم›.

**لاما** / lāmā/: [فرانسوی] اسم. لاما: ۱. سەرناوی پیشەوایانی ئایینی لامایی ۲. /ها/ گیانەوەرێکی گوانداری جووت‌سم و کاوێژکەرە لە باشووری ئامریکا دەژی، لە وشتر دەچێ و پێستەکەی بەنرخە.

**لامارکیسم** / lāmārkîsm/: اسم. لامارکیسم؛ بیرۆکەی ژان باتیست لامارک (۱۷٤٤-۱۸۲۹ ز.) کە دەڵێ ئاقار بە سەر پێکهاتەی گیا و گیانەوەراندا گۆڕانکاری دێنێ و ئەم گۆڕانکاریەش بۆ بەرەگەلی دوایی دەمێنێتەوە.

**لامائی** / lāmā'î/: [فرانسوی] ☜ **لامایی**

**لامایی** / lāmāyî/: اسم. لامایی؛ لقێکی ئایینی بوودایی کە لە تەبەت گەشەی کرد: **لامائی**

**لامپ** / lāmp ، ها/: [فرانسوی] اسم. چرا؛ لامپە؛ لامپ؛ گلۆپ؛ گوڵۆپ؛ کەرەستەی رووناکیدەری کارەبایی.

▣ **لامپ ادیسن**: لامپی ئەدیسۆن؛ گلۆپ؛ لامپ شۆق؛ لامپی سەرپێچداری ئاسایی.

**لامپ خبر** ☜ **لامپ سیگنال**

**لامپ سیگنال**: لامپی سیگنال؛ لامپێ کە لە بار و دۆخێکی تایبەتی و بۆ ڕاگەیاندنی مەترسی هەڵدەبێ: **لامپ علایم؛ لامپ خبر**

**لامپ علایم** ☜ **لامپ سیگنال**

**لامپ فلورسنت**: لامپی فلۆرسێنت؛ لامپێکی لوولەیی پڕ لە گازی ئارگۆن و نەختێک هەڵمی جیوە، بە دوو ئەلکترود لە دوو سەریەوە کە لە کاتی دامەزرانی وڵتاژ، تیشکی فلورسێنت لە ماکی دیوارەی لامپەکەوە دەردەکەوێ: **لامپ مهتابی؛ مهتابی**

**لامپ گازی**: لامپی گازی؛ گلۆپێک بە دوو ئەلکترودەوە پڕ لە گازی نەجیب (وەک ئارگۆن یا نیئۆن).

**لامپ مهتابی** ☜ **لامپ فلورسنت**

**لامپ نئون**: لامپی نیئون؛ چرایەکی پڕتیشک بە هێندێک گازی نیئونەوە.

**لامپا** / lāmpā ، ها/: [از فرانسوی] اسم. لەمپە؛ لەمپا؛ لامپا؛ لامبە؛ چرای شووشە لە سەری نەوتی.

**لامحاله** / lāmahāle/: [عربی] قید. ۱. چاری‌ناچار؛ بە ناچار؛ ناچاری؛ چارناچاری ۲. *[مجازی]* لانی‌کەم؛ لای کەم.

**لامذهب** / lāmazhab ، ها/: [عربی] *صفت.* لامەزەب؛ لامەزەو؛ بێ‌بڕوا؛ لامەسەب. هەروەها: **لامذهبی**

**لامروت** / lāmorov(v)at ، ها/: [از عربی] *صفت.* ناکەس؛ نامەرد (جۆرێ جنێوە).

**لامسب** / lāmassab ، ها/: [از عربی] *صفت.* *[گفتاری]* لامەزەو؛ لامەسەب.

**لامسه** / lāmese/: [عربی] اسم. ساوایی؛ ساوانی؛ هەستێ کە لە ڕێی دەمارگەلی ژێر پێستەوە بڕێ تایبەتمەندی شت و دەور و بەر (وەک ساردی، گەرمی، زبری و نەرمی) دەناسێتەوە ‹حس لامسه: هەستی ساوایی›.

**لامصب** / lāmassab ، ها/: [از عربی] *صفت.* *[گفتاری]* لامەزەو؛ لامەسەب.

**لامل / lāmel**، ـها/:[؟]/اسم. لامیل؛ لەتـە شیشەیەکی ٢٠×٢ میلی‌میتری بـە ئەسـتووری ٠,٢ میلـی‌میتـرەوە بـۆ داپۆشـانی نموونـەی میکرۆسکۆپی سەر لام.

**لامی / lāmî**/:اسم. ئێسـکێک لـە بـنی زمـان و ژوور گەروودا.

**لانتان / lāntān**/: [فرانسوی] ☜ **لانتانم**

**لانتـانم / lāntānom**/: [انگلیسـی]/اسم. لانتـانوم؛ توخمی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٥٧ و کێشی ئەتومی ١٣٨,٩٠، نەرم، چەکوشخۆر و بە ڕەنگی سـپیەوە کـە تایبەتمەنـدی پەڕەپـەڕە بـوون و تەلبوونی هەیە: **لانتان**

**لانتانید / lāntānîd**، ـها/: [فرانسـوی]/اسم. لانتانید؛ ناوی گشتی بۆ دەستەیەک توخمی کانزایی لـە ژمارەی ئەتومی ٥٨ تا ٧١.

**لانـولین / lānolîn**/: [فرانسـوی]/اسـم. *[شـیمی]* ڕۆنی‌خوری؛ لانولین؛ ماکێکی زەردی چەورە لـە پەشم دەگیردرێ کە بە سانایی پێست دەیمژێ و لە بەرهەمهێنانی مەلـهەم و مـاکی ڕازێنـەری پێستدا بە کار دەچێ.

**لانە / lāne**، ـها/:اسم. هێلانە؛ هێلوون؛ هێلیوون؛ هێلیان؛ هیلیانی؛ لیانی؛ ئیلان؛ هۆلانە؛ هـێلین؛ هێلینک؛ هێلان؛ هولانـە؛ لوونـە؛ لان: ١. کـاپۆ؛ واجـا؛ دۆرچ؛ مالـی پەلـەوەران ‹لانـەی کبـوتر: هێلانەی کۆتر› ٢. شارە؛ شـار؛ کولـێن؛ کولانـە؛ مالی برێ گیانەوەر (وەک مێروولـە، هـەنگ و...) ‹لانەی مورچە: شـارە مێلـوورە› ٣. کـولان؛ کـون؛ کونـە؛ کونـا؛ لـەهن؛ گەمـڕ؛ کۆلیـت؛ کوریـت؛ کۆزک؛ مالـی بـرێ گیانـداری درنـدە و کـەوی (وەک شێر، مار، ڕێوی، پشیلە، سەگ و...) ‹لانـەی شیر: کولانـی شێر› ٤. *[تعریض]* کەلاوە؛ جێ ژیانی تەنگ و تاریک و شێداری مرۆ.

◘ **لانە کـردن:** هێلانـە/ کولانـە/ هۆلانـەکردن؛ هیلیان کـەردەیوە؛ لیانـەوە نیـەی؛ شـوێنێک کردنە هێلانـە ‹دو تـا پرسـتو در زیـر سـقف لانـە کـردەانـد: دوو پەڕەسـێلکە لـە بـن میچەکـەدا هێلانەیان کردووە›.

**لانە گذاشـتن:** هێلانـەکردن؛ هێلانەکردنـەوە؛ هێلانـە درووس‌کـردن؛ لیـان وەش‌کـەردەی؛ لیانەوەکەردەی؛ هێلانە دانیان ‹روی درخت لانە گذاشتە بود: لە سەر دارەکە هێلانەی کردبوو›.

**لانەزنبوری / lānezambûrî, -zanbûrî**/: [فارسی/ عربی] *صفت.* شـانەهەنگی؛ شـارە زەردەوالـەیی؛ خاوەنی بیچم یان بە شێوەی شەش گۆشـی لـە پـەنای یـەکـتـری ڕێـکوپێـک، وەک شـانەی مێشەنگوین.

**لانـەسـازی / lānesāzî**/:اسم. هێلانەسـازی؛ گوزووز؛ لانەکری؛ کار و ڕەوتی هێلانە کردنەوە.

**لاورنسـیم / lāvrensiyom**/:اسم. لاڤرینسـیوم؛ توخمی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ، ئـاخرین تـوخمی دەستەی ئاکتینیـدەکان، بـە ژمـارەی ئـەتومی ١٠٣، کە دەسکردە و لە سروشتدا نیە.

**لاوصـول / lāvusûl, lāvosûl**/: [عربـی] *صـفت.* ١. وەرنەگیراو؛ دەس‌نەکەوتوو؛ دەسـتـنـەهاتوو؛ بەدەس‌نەگەیشتوو؛ دەس‌نەڕەس ‹طلب لاوصـول: قەرزی وەرنەگیراو› ٢. دوورەدەست؛ تایبەتمەندی شتێک کە دەستی پێ ڕانەگا.

**لاوک / lāvak**، ـهـا/:اسـم. قـەفیز؛ تـەغاری دارینە.

**لاهوت / lāhût**/: [معرب از عبـری]/اسم. لاهـووت؛ دنیای سەرتر و بەرتر؛ دەسەلاتگەی بوونەوەرانی نامادی (وەک فریشتە و هەلبژاردووان).

**لاهـوتی / lāhûtî**/: [معـرب] *صـفت.* لاهـووتی؛ ئاسمانی؛ سەر بە دنیای سەرتر و بەرتر.

**لای / lāy**/:اسم. ١. لیتە؛ لیتور؛ لیتاو؛ لم؛ لمـاو؛ لـەژم؛ لـەزم؛ لمـت؛ لۆسـتک؛ لـەوە؛ لـەنگێز؛ لەنگێزە؛ لیجە؛ جلیت؛ جلیتاو؛ شـۆقاف؛ زلیـت؛ تلۆل؛ ڕیچەپوڵ؛ هەرگی لە ئاودانیشتوو ٢. تلتە؛ تلپە؛ تلف؛ تلفە.

**لای / lāye**/: *حرف.* ناو؛ لە نێو؛ ناو بەین؛ بـەینی؛

بەینوو؛ نێوی؛ ناوی؛ لە نێوان شت یا شتانێ ‹این کاغذها لای کتاب بود؛ پول افتاده بود لای لباس‌ها: ئەم قاقەزە لە نێو کتێبەکەدا بوو؛ پارەکە کەوتبووە ناو جلەکانەوە›.

▣ **لای دست کسی فرستادن:** *[کنایی]* بە دەردی کەسێک بردن ‹شوهر دومی را هم فرستاد لای دست شوهر اولی و باز بیوه شد: شووە دووهەمەکەشی بە دەردی ئەویتر برد و دیسانەوە بە بێوەژنی مایەوە›.

**لایتغیر** / lāyataqayyar/: [عربی] *صفت.* نەگۆڕ؛ نەگووڕ؛ لەجێ ‹تصمیم لایتغیر: بڕیاری نەگۆڕ›.

**لایتناهی** / lāyantanāhî/: [عربی] *صفت. [ادبی]* بێسنوور؛ بێبڕانەوە؛ بێپەڕ؛ بێکەوشەن ‹آسمان لایتناهی: ئاسمانی بێسنوور›.

**لایحه** / lāyehe ، ـها؛ لوایح/: [عربی] *اسم.* لایەحە؛ نوسراوەیەک بۆ پێشکەش‌کردن بە لێژنەیەکی بڕیاردەر.

▣ **لایحەی دفاعی:** نووسراوەیێ کە تێیدا، بەرگومان یان بریکارەکەی بیر و ڕای خۆی ئاراستەی دادگا دەکات.

**لایحەی قانونی:** قانوونێ کە لە لایەن دەوڵەتەوە بۆ بڕیاردان ئاراستەی پارلەمان دەکرێ.

**لایروبی** / lāyrûbî/ ☜ **لاروبی**

**لایزال** / lāyazāl/: [عربی] *صفت. [ادبی]* نەمر؛ هەرمێن؛ مانا؛ هەتاهەتایی ‹خداوند لایزال: خودای نەمر›.

**لایعقل** / lāya'qal, lāya'qel/: [عربی] *صفت. [ادبی]* بیرئاڵۆز؛ بێئاوەز؛ بێعەقڵ ‹مست لایعقل در گوشەای افتاده بود: مەستی بیرئاڵۆز لە سووچێک کەوتبوو›.

**لایق** / lāyeq/: [عربی] *صفت.* ۱. هێژا؛ شایستە؛ بەرکەتی ‹ مرد لایق: پیاوی هێژا › ۲. شیاو؛ سزاوار؛ دەرخۆر؛ تاشیە؛ ڕەوا؛ لەبار؛ هاولە ‹ لایق فروش: شیاوی فرۆتن›.

**لایقرأ** / lāyoqra'/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ناخوێندنی؛ وا ناخۆش کە نەخوێندرێتەوە (زۆرتر بۆ خەت و نووسراوە دەگوترێ).

**لاینحل** / lāyanhal/: [عربی] *صفت. [ادبی]* بێچارەسەر؛ بێچار؛ چارنەکراو ‹مشکل لاینحل: کێشەی بێچارەسەر›.

**لاینفک** / lāyanfak(k)/: [عربی] *صفت. [ادبی]* لێک‌نەبڕاو؛ جیایی هەڵنەگر؛ لێک‌نەبڕ؛ جیا نەبوو؛ جوێ نەبوو؛ جوێ نەکراو ‹آتش و گرما دو چیز لاینفک هستند: ئاور و تین دوو شتی لێک‌نەبڕاون›.

**لاینقطع** / lāyanqate'/: [عربی] *قید.* بێبڕاوانە؛ لە پەستا؛ لە سەر یەک؛ پەساپەس؛ سەرەمڕ؛ بە شێوەی پێوەست و لێک نەبڕاو ‹لاینقطع یک حرف را تکرار می‌کرد؛ باران لاینقطع می‌بارید: لە سەر یەک قسەیەکی دووپات دەکردەوە؛ باران بێبڕانەوە دەباری›.

**لاینوتایپ** / lāynotāyp/: [انگلیسی] *اسم.* لاینۆتایپ؛ شێوەیەک لە پیت‌چنی تەختی ماشین کە پیتەکانی هەر دێڕێک پێکرا دادەڕێژرێن.

**لایه** / lāye ، ـها/: *اسم.* ۱. لا؛ لۆخ؛ دەق؛ تۆ؛ توێ؛ لۆ؛ لوو؛ کنج؛ ڕوو یان پۆشەنێ کە لە ڕوویەکی‌ترەوە زۆر نزیک یان پێوەی چەسپاوە ‹شیشەی دولایە: شووشەی دوولا› ۲. *[زمین‌شناسی]* توێژ؛ تۆژ؛ لوچ؛ لوج؛ کاژە؛ چین؛ بەشێکی بچووکتر لە نیشتەیەک کە لە سەر و خوارەوە دوو چینی‌تر دایانگرتووە.

▣ **لایەی زاینده:** *[گیاه‌شناسی]* چینێک لە خانەگەلی گیا کە لە پەستا زیاد دەکەن و لە نێوان بەشی چێوی نێرۆکدان.

**لایەبندی** / lāyebandî ، ـها/: *اسم. [جامعه‌شناسی]* توێژبەنی؛ ڕەوتێ کە دەبێتە هۆی جیا بوونەوەی بنەماڵەکانی کۆمەڵگایەک لە باری ئابووری، دەسەڵات و هەموو مافێکی کۆمەڵایەتیەوە.

**لایی** [1] / lāyî ، ـها/:*اسم.* ناواخن؛ ناوئاخن؛ ئاخنـه؛ توێژێک که بۆ زۆرکردنەوەی ئەستووری، پتەوی یان وەکوو بەرگرێک لە نێوان ئاسەڕ و ڕووکـاری دەخەن: **لائی**

**ـ لایی** [2]: *پیواژه.* ـ لایی؛ ـ لا؛ ـ لایه؛ ـ توێژ؛ ـ تـۆ؛ ـ چین؛ ـ دەق؛ خاوەنی لا ‹سەلایی، چهارلایی: سێلایی، چوارلا›: **لائی**

**لاییدن** / lāyîdan/: *مصدر. لازم.* // **لایید**: وەڕی؛ **می لاید**: دەوەڕێ؛ **ـ** // وەڕین؛ حەپانـدن؛ حەپـه کردن؛ گەفین؛ گەفەی؛ گەفای؛ ڕەوین؛ حەپین؛ حەپان؛ عەف ــعـەف کـردن؛ کـووزین؛ وەڕەوەڕ کردنی سەگ: **لائیدن**

**لئامـــت** / la'āmat, le'āmat/: [عربـــی]/*اســم.* خوێڕیەتی؛ تەرەسـی؛ پەسـبندەیی؛ بـێ‌فـەڕی؛ هۆڤەبەری؛ نانەجیبی؛ بێ‌ئاوڕوویی؛ پەستی.

**لئیم** / la'îm ، ـان/: [عربی] *صفت. [ادبی]* پەسـت؛ خوێڕی؛ تەرەس؛ هۆڤەبەر؛ بـێ‌فـەڕ؛ پەسـبندە؛ نانەجیب؛ بێ‌ئاوڕوو.

**لب** / lab/: *اسم.* لێو؛ لچ؛ لیچ؛ لێڤ؛ لەو؛ لەب؛ لۆ:
۱. ـها؛ ـان/ لاو؛ لەوس؛ لەوچ؛ لەچەنە؛ دوو توێژە گۆشتی دەرەکی زاری مۆرەداران کە لە مرۆڤـدا بە ڕەنگی چێرەیی یان سوور و برێ جار قاوەییە
۲. *[گفتاری]* لێوار؛ لێـوارە؛ زێـوار؛ ڕەخ؛ روخ ‹لب دریـا، لـب اسـتخر: لێـواری زەریـا، لیچـی ئەسـتێر›
۳. *[گفتاری]* لێوارە؛ لێوار؛ قەراخ؛ قەراخەی دەفـر یان چالـێ ‹لـب چاه، لـب بشـقاب: لێـوارەی بـیر، قەراخی دەوری›.

⊡ **لب از لب باز نکردن/ نگشودن**: *[کنایی]* متـەق لێوە نەهاتن؛ دەم نەکردنەوە؛ قسـە نـەکردن:
۱. قروقپ کردن؛ لچ نەترازاندن؛ لێو لە یـەک نەکردنـەوە؛ لـەبز نەگەڕانـدن؛ هـیچ نـەگوتن ‹هرچه کردیم لب از لب باز نکرد: هەرچیکمان کـرد متەقی لێـوە نـەهات› ۲. نەدرکانـدن؛ ڕازداری کردن؛ ڕاز هەلگرتن.

**لب بـاز کـردن**: *[کنـایی]* دەم کردنـەوە؛ قسـە کـردن؛ هاتنـە قسـە: ۱. لێـو بزوانـدن؛ لـچ جوولاندن ۲. درکاندن؛ ڕاز دەرخستن.

**لب برچیـدن**: لـچ هـەلاوردن/ هەلـقرچاندن/ هەلقوتاندن؛ لچ خوارکردنەوە؛ لێو دالۆچاندن؛ لەوسـێ برەمنـەی؛ لێـو شـۆڕکردنەوە؛ لـچ داژەندن؛ لچ/ لێو بردنەوە؛ لێو ترینجاندن؛ کـۆ کردنەوەی لێو لە بەر وەڕەزی یان خەمباری.

⊡ **لب بستن**: دەم بەسـتن؛ دەم نانەیـەک؛ لـچ داخسـتن؛ دەم بینتـەی؛ دەم نەکردنـەوە؛ بێ‌دەنگ بوون. هەروەها: **لب دوختن**.

**لب ترکردن/ ترکاندن**: *[مجازی]* دەم‌کردنـەوە؛ لـچ/ دەم جوولانـەوە؛ لێـو / لـچ تـەڕ کـردن؛ قسەکردن ‹تو لب تر کنی، من می‌آورمش: تـۆ دەم بکەیەوە، من دەیهێنم›.

**لب دادن**: *[گفتـاری]* ماچ دان؛ لێو تەقان‌کـردن (بە شۆخی).

**لب غنچه کردن**: دەم کردنە نوقڵ؛ هەر دووک لێو هێنانە یەک و دەم چکۆلەکردنەوە.

**لب گازگرفتن/ گزیدن**: لچ/ لێو گەسـتن؛ لێـو گەستنەوە؛ قەپ بـە لچـدا کـردن (زۆرتـر بـە نیشانەی خەم، شەرم یان پەژیوانی).

**لب نزدن**: *[کنـایی]* چەشکە نـەکردن؛ دەم لـێ نـەدان؛ ڕۆژوو پـێ‌نەشـکاندن؛ ڕۆژوو لـێ نەشکاندن؛ دەم نەدا پوەی؛ نەنیانە بـان زوان؛ هیچ نەخواردن ‹از دیروز به هـیچ چیـز لـب نـزده است: لە دوێکەوە هیچی چەشکە نەکردووە›.

**لب** / labe/: *حرف.* ڕەخی؛ لێواری؛ لێڤاری؛ لچی:
۱. روخی؛ زێواری؛ لە قەراخی کۆمای ئاودا ‹لـب دریا رفتن: ڕەخی زەریـا چـوون› ۲. لـە لچـی؛ لـە لێوی؛ لە لێوارەی چاڵێکدا ‹لب چاه ایستاده بود: لـە لچی بیرەکەدا ڕاوەستا بوو›.

⊡ **لـب آب/ چشـمه/ رودخانـه بـردن و تشـنه برگرداندن**: *[کنایی]* بردنە سەر کـانی و تینـوو هێنانـەوە/ هاوردنـەوە؛ زرینـگ و فـرز و بـە سیاسەت بوون ‹این آدم ده تا مثل شما را مـی‌بـرد

لب أب و تشنه برمی‌گرداند: **ئەم کابرایە دەی وەک ئێوە** دەباتە سەر کانی و تینوو دەتانهێنێتەوە›.

**لب** / lob/: [فرانسوی] ☜ **لَپ**

**لُب** / lob(b)/: [عربی]/اسم. کاکڵە؛ پوختە؛ تەڵبژێر؛ ناوکە یان ناوەڕۆکی سەرەکی شتێ ‹لُب مطلب: کاکڵەی مەبەست›.

**لباده** / labbāde/: [عربی]/اسم. [قدیمی] لبادە؛ لۆپ؛ جۆرێ فەرەنجی شۆڕ و فش و فۆڵ لە لباد یان خوری کە وەک عابا بە سەر جلکی‌تردا دەکرایە بەر.

**لباس** / lebās، ـها؛ البسه/: [عربی]/اسم. جل؛ بەرگ؛ جلک؛ جنک؛ هنجگ؛ دلنگ؛ کنج؛ گنج؛ پڕتاڵ؛ قەو؛ جل‌وبەر؛ جل‌وبەرگ؛ لیباس؛ پۆشەن.

◙ **لباس پلوخوری**: *[کنایی]* جلی میوانی؛ جلی پلاو خواردن؛ جلە ئاغایی؛ جلە تایبەتی؛ لیباس فیس؛ جلکی نفت و نوێ؛ جلکی تایبەتی میوانی.

**لباس خواب**: شەوخەف؛ جل خەو؛ بەرگی خەو؛ لەپاچە؛ جلکی تایبەتی خەوتن.

**لباس رو**: جلی ڕوو؛ ئەو جلەی بە سەر جلی‌تردا لەبەری دەکەن (وەک کۆت و پاڵتاو). بەرانبەر: **لباس زیر**

**لباس زیر**: جلی ژێر؛ ئەو جلە دەیکەنە ژێر جلی‌ترەوە (وەک ژێرکراس و ژێر شواڵ). بەرانبەر: **لباس رو**

**لباس سبک**: ۱. سووکە جل؛ جلی ناسک؛ بەرگی کەم یان ناسک ‹امروز فکر کردم هوا گرم است لباس سبک پوشیدم: ئەوڕۆ وامزانی هەوا گەرمە سووکە جلێکم لەبەر کرد› ۲. جلی سووکی؛ جلک سۆکی؛ جلی ناماقووڵانە؛ جلێ کە بە لەبەرکردنی، مرۆی پێ سووک دەبێ. بەرانبەر: **لباس سنگین** ‹در آن مجلس رسمی، لباس سبکی پوشیده بود: لەو کۆڕە فەرمیەدا، جلیکی سووکی لەبەر کردبوو›.

**لباس سنگین**: *[مجازی]* ۱. جلی گران‌بایی ۲. جلی ماقووڵانە؛ جلی سەنگین؛ جلێ کە نیشانەی سەنگینی و فەرمی بوونە. بەرانبەر: **لباس سبک** ‹باید لباس سنگین بپوشی: دەبێ جلی ماقووڵانە لەبەر کەیت›.

◙ **لباس به تن کسی گریه کردن/ زار زدن**: *[مجازی]* جل بە کەسێ نەکەوتن و لە بەریدا زۆر ناشیرین بوون.

**لباس‌شخصی** / lebāsšaxsî/: [عربی] *صفت*. بە جلێکی بێجگە جلی چەکداری.

**لباسشویی** / lebāsšûyî/: [عربی/ فارسی]/اسم. ۱. جلک‌شۆری؛ جل‌شۆری؛ کار و ڕەوتی جل شوتن ۲. /ـها/ جلشۆرخانە؛ کارگای جل شوتن ۳. /ـها/ ماشین لباسشویی ☜ **ماشین**

**لباشن** / labāšan/ ☜ **لویشه**

**لباف** / labbāf، ـها؛ ـان/: [از عربی]/اسم. ۱. تەونگەر؛ تەونکەر؛ ئەوەی بەڕە و جەگەن دەتەنێ ۲. دووریێنەری خێوەت و ڕەشماڵ ✱ **لَوّاف**

**لبافی** / labbāfî/: [از عربی]/اسم. ۱. تەونگەری؛ تەونکەری؛ کار یان پیشەی تەونکەر ۲. /ـها/ کارگەی تەونگەر ✱ **لَوّافی**

**لبالب** / labālab/: *صفت*. لێوانلێو؛ لێواولێو؛ لیپان‌لیپ؛ لیپاولیپ؛ لچانلیچ؛ لچانلچ؛ لەماڵەم؛ لواڵەو؛ پڕاوپڕ؛ پڕبەپڕ؛ لیپان؛ دارماڵ؛ دەرگاخن؛ گۆزان؛ لچان؛ سەرڕێژ؛ مشت؛ تەواو پڕ هەتا لێواری دەفر ‹جام لبالب: جامی لێوانلێو›: **لب‌به‌لب**[1]

**لب‌بر** / lab.bor/: *صفت*. لچبڕ؛ لێوبڕ؛ لێووڕ؛ بڕاو لە لێوارەوە ‹مواظب باش لب‌بر نکنی، از هر طرف یک سانت حاشیه بگذار: هۆشت بێ لچبڕی نەکەی، لە هەر لاوە سانتێ پەراوێزی بۆ بهێڵەوە›.

**لب‌بند** / lab.band، ـها/: اسم. لچوەنە؛ لچبەنە؛ لێواری؛ بەرزی تای دەرگا و پەنجەرە، بۆ نیشتنە سەر یەک و کپ بوون.

**لب‌به‌لب**[1] / lab.belab/ ☜ **لبالب**

**لب‌به‌لب**[2]: *قید*. لچ بە لچ؛ لچاولچ؛ لێواولێو؛ لێو

یان لێوارەیەکی بە سەر ئەویتردا ‹دو تکه را لب به لب می‌گذاریم و چرخ می‌کنیم: دوو تیکەکە لچ بە لچ دادەنین و دەیدوورین›.

**لب پر** / labpar/: *صفت. [گفتاری]* ۱. سەرڕێژ؛ لیپ؛ کەیل؛ تژە؛ لچان ‹لب‌پر زدن: سەرڕێژ کردن› ۲. کەل؛ کال؛ لچ پەڕ؛ لچ پەڕیاگ ‹لب پر شدن: کەل بوون›.

◘ **لب پر زدن:** سەرڕێژکردن؛ سەرڕێژ بوون؛ کەلاوکەردەی؛ لێ ڕژانی تراوی نێو دەفر بە هۆی لیپاولیپ بوون و جوولەوە.

**لب پر شدن:** کەل/ کەت بوون؛ لچ‌پەڕ بوون؛ هەبلین؛ کال بوون؛ لچ‌پەڕیاگ بوون؛ لێوپەڕی بوون؛ شکان و داکەوتنی تیکەیەکی بچووک لە لێواری دەفر ‹دو تا بشقاب لب‌پر شدند: دوو دانە دەوری کەل بوون›.

**لب پریده** / labparîde ، ـها/: *صفت.* کەل؛ کال؛ کەت؛ لێوارپەڕیو؛ کەل‌بووگ؛ لچ‌پەڕیاگ؛ لێوپەڕی؛ کال بوو؛ کەت بوو ‹لیوان لب‌پریده: لێوانی کەل›.

**لب تخت** / labtaxt/: *صفت.* لێوپەل؛ پەل؛ لێوتەخت؛ لچساو؛ بە لێوارەی تەختەوە ‹بشقاب لب‌تخت: دەوری لێوپەل›.

**لب تشنه** / labtešne ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* دەم‌وشک؛ دەم‌تینی؛ دەم‌تینوو؛ بە لێوی تینگ و وشکەڵاتووە: **تشنه‌لب**

**لب چش** / labčeš/: *اسم. [گفتاری]* زوان‌چێژ؛ چەشکە؛ تام‌دەم؛ نەختێکی کەم لە چێشت بۆ تام کردن.

◘ **لب چش کردن:** چێشتن؛ تام دەمێ کردن؛ زوان‌چێژکردن.

**لب چور** / labčûr/: *صفت.* لچن؛ لچۆ؛ لۆچن؛ لۆچوو؛ لەوسن؛ لچ‌قەوی؛ لەوسێ؛ لۆسێ؛ سێ لیف؛ وشتەلچ؛ وشترلچ؛ لەوس‌پان؛ لێوئەستوور: **لب‌شتری**

**لبخند** / labxand ، ـها/: *اسم.* بزە؛ زەردە؛ خەنە؛ گرنژ؛ زەردەخەنە؛ لچ‌خەنە؛ دزەخەنە؛ لێوەخەنە؛ لێڤخەنە؛ گورمز؛ گورمزی؛ پەنەوا؛ وردە بز؛ لێڤ‌کەنی؛ پێکەنینی وا کە تەنیا لێو دەبزوێ.

◘ **لبخند زدن:** زەردەخەنەکردن؛ بزەکردن؛ زەردەکردن؛ لچ‌خەنەکردن؛ گورمزین؛ گرنژین؛ گرژین؛ گرژینەوە؛ ڤەکرژین؛ پێکەنینێ کۆتا و بێ‌دەنگ ‹مرا که دید لبخند زد: ئەمنی کە دی زەردەخەنەیەکی کرد›.

**لب خوانی** / labxānî/: *اسم.* لچ‌خوێنی؛ کار یان ڕەوتی تێگەیشتن لە قسەی بێژەر بەبێ بیستن و تەنیا بە چاوکردن لە جوولەی لچی ‹او به کمک لب‌خوانی حرف‌های من را فهمید: ئەو بە لچ‌خوێنی لە قسەکانم تێگەیشت›.

**لب دوز** / labdûz/: *صفت. [مجازی]* شیرینچک؛ شیرینجق؛ لچق؛ قەن تەواو؛ قەن— قەن؛ شەکەرتام؛ زۆر شیرین.

**لبریز** / labrîz/: *صفت.* لچان؛ سەرڕێژ؛ لێڤ‌ڕێژ؛ کەفرێژ؛ کەفەڕێژ؛ پراوپڕ؛ مەتەلۆس؛ دارماڵ؛ واز؛ تژە؛ چور؛ لیپاولیپ؛ پڕێ وا کە خەریک بێ سەر ڕێژ بکا.

◘ **لبریز شدن:** سەرڕێژ بوون؛ پراوپڕ بوون؛ لیپ بوون؛ کەفرێژ بوون؛ لیپان بوون؛ لێڤ‌ڕێژ بوون؛ لێوانلێو بوون؛ هاتنە کەلاو؛ کەلاو بیەی؛ پڕ بوون و بە سەر قەراخەدا ڕژان ‹لبریز شد شیر را ببند: سەرڕێژ بوو، شێرەکە ببەسە›. هەروەها: **لبریز کردن**

**لب سوز** / labsûz/: *صفت. [گفتاری]* دەم‌سووتێن؛ زۆر داخ (بۆ خواردن و خواردنەوە).

**لب شتری** / labšotorî/ ☜ **لب چور**

**لب شکری** / labšekarî, -šakarî ، ـها/: [فارسی/ سنسکریت] *صفت.* کەتە؛ کەچ؛ قەشاف؛ لێوکەل؛ لێوکەت؛ لچ‌کەتە؛ حەفلچ؛ بە لێوێکی قەڵشاو کە ڕێکی ئەویتر نەبێتەوە.

**لب طلایی** / labtalāyî/: [فارسی/ عربی] *صفت.* لەب‌زێڕین؛ لێوەزێڕین؛ لچ‌زێڕین؛ کەنار زێڕ؛ بە

لێوارەی زێڕینەوە ‹بشقاب لب‌طلایی: دەوری لێوزێڕین›.

**لب‌گزه** / labgaze/: اسم. [گفتاری] لچ‌گەست؛ لێوەگەزە؛ کاری گەستن و خواردنەوەی لچ لە بەر پەژیوانی یان بۆ وریا کردنەوەی کەسێ لە شتێک ‹آزاد رو به من لب‌گزه کرد که مراقب حرف‌هایم باشم: ئازاد بەرەو من لچ‌گەستێکی کرد کە ئاگام لە قسەی خۆم بێ›.

**لبلاب** / lablāb/: [عربی از سریانی] ☜ پیچک صحرایی، **پیچک**

**لبنی** / labanî/: [عربی] صفت. [ادبی] سپیاتی؛ سەر بە شیر و بەرهەمەکانی.

**لبنیات** / labanîyyāt/: [عربی] اسم. سپیاتی؛ شیر و خۆراکی بەرهەمهاتوو لە شیر (وەک ماست، پەنیر، کەرە و...).

**لبنیاتی** / labanîyyātî، ـها/: [عربی] اسم. ۱. فرۆشگای سپیاتی ۲. فرۆشیار یان بەرهەمهێنەری سپیاتی.

**لبو** / labû، ـها/: اسم. چۆنەر؛ لبوو؛ چەوەندەر قەندی کولاو.

**لبوئی** / labû'î/ ☜ **لبویی**

**لب‌ولوچه** / lab-o-lowče, -lo:če، ـها/: اسم. [گفتاری] دەمولێو؛ لچولێو؛ دەموپل؛ دەمولەوس؛ دەموفلچ؛ لپ‌لەوس؛ هەر دووک لێو و دەوروبەری ‹آب از لب‌ولوچه‌اش راه افتاد: ئاو بە دەمولێویدا هاتە خوار›.

▣ **لب و لوچه‌ی آویزان**: [مجازی] لووت/ لێوی داژەنیو؛ لووت/ گوپ داشۆڕیاگ؛ لیچی داژەناو؛ لچ و لێوی خوار؛ چۆنیەتیەک نیشانەی خەمین و دلمەند بوون ‹چرا لب و لوچه‌ات آویزان است؟: بۆ وا لووتت داژەنیوە؟›.

**لبویی** / labûyî، ـها/: اسم. چۆنەرفرۆش؛ لەبووفرۆش؛ فرۆشیاری چۆنەری کولاو: **لبوئی**

**لبه** / labe، ـها/: اسم. لێو؛ لێڤ؛ پەڕ؛ لچ؛ دەم؛ لێوار؛ لێوارە؛ زێوار؛ زار: ۱. دەمە؛ لێواری تیژی تێخ یان هەر ئامێرێکی تیژ ‹لبه‌ی چاقو: دەمەی چەقۆ› ۲. هێلی باریکی نێوان دوو ڕووبەری شتێک ‹لبه‌ی لیوان: لچی لیوان› ۳. بەرزایی یان دەرپەڕاوی قەراخی شتێک ‹لبه‌ی بام: لچی بان›.

▣ **لبه‌ی بام**: پاسار؛ پاسارە؛ سەرپاسار؛ کەلەکەپاسار؛ کەلەک؛ سواندە؛ سوانە؛ سەرسوانە؛ سوانگە؛ سێڤاندە؛ گێسوانە؛ گوێسوانە؛ گوێسەبانە؛ کێلوانە؛ کەتیف؛ قانچە؛ لچی بان.

**لبه‌دار** / labedār، ـها/: صفت. لچدار؛ لێواردار؛ لێوارەدار؛ پاساری (بۆ کلاو)؛ بە دەرپەڕاویەک لە لێواردا ‹کلاه لبه‌دار: کلاوی لچدار›.

**لبه‌دوزی** / labedûzî/: اسم. کار یان ڕەوتی دوورینی قەراخی جل (وەکوو یەخە، سەرقۆڵ یان پالداوێن).

**لبیک** / labbayk, labbeyk، ـها/: [عربی] صوت. بەڵێ؛ ئەرێ؛ باشە؛ وشەی قەبووڵ کردن.

▣ **لبیک گفتن**: بەڵێ/ ئەرێ/ باشەگوتن؛ خواست و دەستووری کەسێک وەرگرتن.

**لپ** / lap، ـها/: اسم. [زیست‌شناسی] پل؛ کووز؛ بەشێکی خڕیلە لە ئەندام کە بە درز، قەڵشت یان دیوارە لە بەشەکانی دی جوێ دەبێتەوە (وەک پەلی مێشک، سی، جەرگ): لُپ؛ لُوب

**لپ** / lop، ـها/: اسم. [گفتاری] گۆنا؛ گوپ؛ گپ؛ گووپ؛ گیپ؛ گوب؛ کپ؛ شیپک؛ شیپ؛ گیپش؛ لۆپ؛ سەرکولمە؛ گەلپ؛ گۆن؛ کولمە؛ لام؛ خڕی ئەملا و ئەولای ڕوومەت.

**لپه** / lap(p)e، ـها/: اسم. ۱. نوخۆشەر؛ نوخوەشەر؛ نخۆشەر؛ نەخۆشەر؛ مقەشەر؛ مەقەرشەر؛ ئارێنۆک؛ لەپە؛ لاپە؛ لەتکەنۆک؛ نۆکەوردەی دووقاش بوو بە ئاسیاو و دەسهاڕ، بۆ ناو خۆرشت و چێشت ۲. [گیاه‌شناسی] لەتکە؛ بەشێک لە تۆمی گیا کە گەڵای لێ دروست دەبێ.

▣ **تک‌لپه**: [گیاه‌شناسی] تایبەتمەندی تۆمێک کە

هەر یەک پاژە (وەک دانەی گەنم).

**دو لپە:** *[گیاەشناسی]* تایبەتمەندی تۆمێک کە بۆخۆی دوو لەتە (وەک نۆک).

◘ **لپـه کـردن:** لەتکـە/ لەپـە/ نەخوەشـەر/ لەتکەنۆک کردن؛ کردنە نەخۆشەر؛ ئارینۆک کـردن؛ چـێ‌کـرنی نەخۆشـەر بـە ئاسـیاو و دەسهاڕ.

**لت / lat ، ـها/:** *اسم.* ١. تا؛ لنگە؛ لا؛ لەت؛ پاژێکی تەخت لە دەزگا یان کۆمەڵەیەک ‹لت کاغذ: لـت در: تای کاغەز؛ لنگەی دەرگا› ٢. *[نامتداول]* تەمەرە؛ ئاسیو؛ تەوەرە؛ لەتمە؛ گەزن؛ زیان ٣. *[نامتـداول]* زەرپ؛ زەبر؛ چەک.

◘ **لت خوردن:** ١. چـەک خـواردن؛ شـەپلاخە خواردن ٢. زیان دیتن؛ خەسار لێ‌کەوتن.

**لت شدن:** ١. لێوە بـوون؛ کنیانـەوە ٢. گـەزن دیتن؛ عەیبار بوون. هەروەها: **لت کردن**

**لتراست / letrāset/:** [انگلیسی] *اسم.* لیتراسـیت؛ کۆمەڵێک پیت و ژمـارەی زمانـێ کـە لـە سـەر کاغەز، پلاستیک یان کانزا لـە چـاپ دراوە و بـۆ خۆشنووسی یان نووسینێکی تایبەت کەڵکی لێ دەگرن: **حروف برگردان**

**لترمـه / laterme/:** [ترکـی/ ؟] *صـفت.* هــەویر؛ تایبەتمەندی نانێک کە باش نـەبرژاوە و هێشـتا هەویرە.

◘ **لترمه کـردن:** نـان خووسـاندن؛ ئـاو لـە نـان ولێن/ پژاندن.

**لتره/ lotre/:** *اسم.* زمانی دەسکرد (وەک زێـزێ یان سپرانتۆ).

**لت و پار / lat-o-pār/:** *صفت.* *[گفتاری]* شڕ و وڕ؛ شەل و پەت؛ شڕ و شیتاڵ؛ لەت و کوت؛ کوت و لەت؛ لەت‌ـلەت؛ کـەرت ـکـەرت؛ تیکەـتیکـە؛ شەقارـ شـەقار؛ ونجڕـ ونجـڕ؛ شـەقار وەقـار؛ پەل‌ـپەل؛ بزڕـ بزڕ؛ پارچە‌ـپارچە؛ کوتـکـوت؛ کوتە‌ـکوتە؛ لەتارـ لەتار؛ زڤارـ زڤار.

◘ **لت و پار شدن:** شڕ و شـیتاڵ بـوون؛ لـەت و کوت بوون؛ کوت‌ـکوت بوون؛ لەت‌ـلەت بوون؛ تیکە‌ـتیکە بوون؛ پەل‌ـپەل بیـەی؛ گـەزخان. هەروەها: **لت و پار کردن**

**لته / late/:** *اسم.* سیپاڵ؛ شرە؛ شڕ و شیواڵ؛ شرە و شیتاڵ؛ شـرە و پـرە؛ ڕیپـۆڵ؛ ڕەپـاڵ؛ ڕیتـاڵ؛ وەتراخ؛ قوماش یان جلکی کۆن و دڕاو.

**لثوی / lasavî/:** [عربی] *صفت.* پـدوویی؛ پـووکی؛ لاوسـی: ١. پێوەندیـدار و سـەر بـە پـووک ٢. بەدیهاتوو (دەنگ) بە پدوو.

**لثه / lase ، ـها/:** [عربی] *اسم.* پـدو؛ پـدوو؛ پـوک؛ پووک؛ پیوو؛ پوو؛ پی؛ پێ؛ پـدی؛ پـودو؛ هـاروو؛ ئاروو؛ لاوس؛ گۆشت ئاساییێکی نێو زاری زۆربەی مۆرغەداران کە ڕیشە و بـنی ددان دادەپۆشـێ و هی مرۆڤ سوور یان سوورکاڵە.

**لج [1] / lac/:** [عربی] *اسم.* *[گفتاری]* ڕق؛ قـین؛ لـەج؛ لەنج؛ جـڕ؛ جیـەڵ؛ بوجـەر؛ سـین؛ ڕک؛ کـوت؛ بەرهەڵستی و پێداگری لە سەری.

◙ **از لج:** لە قین؛ لە قینـا؛ لـە ڕکـدا؛ قینییێنـە؛ قینیــۆ؛ لــە لــەنج؛ لــە ڕووی تــووڕەیی و دژایەتیەوە ‹من هـم از لـج کتابش را پـاره کـردم: منیش لە قینا کتێبەکەیم دڕی›.

◘ **لج افتادن:** کەوتنە لەنجەوە؛ کەوتنە قینـەوە؛ کەوتنە ڕقەوە ‹صاحبخانه با ما لج افتـاده: خـاوەن ماڵەکە لێمان کەوتوتە لەنجەوە›.

**لج کردن:** قین کردن/ گرتن؛ پێ‌چەقاندن؛ پا گــەزدان؛ کەوتنــە ســەر ڕک؛ حــەنگزین؛ لا بوون؛ سین‌کەردەی ‹لج کرد و با ما نیامد: قـینی کرد و لەگەڵمان نەهات›.

**لــج کســی را درآوردن:** ڕەقــی کەســێک هەستاندن؛ قینۆ یۆی دەی؛ بە ئاکاری دژانەی خۆ کەسێ تووڕەکردن ‹همەاش سعی می‌کرد لج مـن را دربیـاورد: هـەر خـەریک بـوو ڕقـی مـن هەستێنێ›.

**لج کسی گـرفتن:** ڕق لـە کەسـێک هەسـتان ‹چقدر از دستش لجم گرفته بـود!: چەنـد ڕقـم لـێ

هەستابوو!›.

**لج**[2]: *صفت. [گفتاری]* زڕ؛ لاڕ؛ دژ؛ بەقین؛ بەڕق؛ وەڕک.

▣ **لج بودن**: لا بوون؛ لەنج بوون؛ بە قین بوون؛ بە ڕەق بوون؛ لە سەر باری نەیاری و دژایەتی بوون.

**لجاج** / lecāc, lacāc/: [عربی]*اسم. [ادبی]* لاساری؛ پێ‌چەقێنی؛ لایی.

▣ **لجاج ورزیدن**: لاساری‌کردن؛ لەنج‌کردن؛ پێ‌چەقاندن.

**لجاجت** / lecācat, lacācat ، ـها/: [عربی]*اسم.* گەدەبەلی؛ پێچەقێنی؛ سەرگورزی؛ پڕکێشی؛ لاساری؛ ڕەچۆیی؛ لاق‌چەقێنی.

**لجاره** / laccāre ، ـها/: [؟] *صفت. [گفتاری]* پەست؛ تەرەس؛ ناکەس؛ نادرووس.

**لجام** / lecām/: [معرب از فارسی]*اسم.* هەوسار؛ ئاوسار؛ وەسار؛ هۆسار؛ هەفسار؛ ئەوسار؛ لەغاو؛ لەخاف؛ لەخاف؛ لەقام.

**لجام‌گسیخته** / lecāmgosîxte/: [معرب/ فارسی] *صفت. [کنایی]* سەرکێش؛ یاخی؛ خۆسەر؛ سەر هەڵبوو ‹سیل لجام‌گسیخته: لافاوی سەرکێش›.

**لجباز** / lacbāz ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* لاسار؛ ناعار؛ جیروو؛ جارەو؛ لەچەر؛ قیرسیچم؛ قیرسیچمە؛ سەرڕەق؛ کەللەڕەق؛ سەرشەق؛ نەگریس؛ لاڕێ؛ سامنج؛ لنج؛ لەنجباز؛ گیڕ؛ مارز؛ مارس؛ سەرسەخت؛ لەچەر؛ گوێ‌نەبیس؛ پێ‌چەقێن؛ نەساز؛ کەمۆت؛ مقڕ ‹این مرد چقدر لجباز است!: ئەم پیاوە چەند لاسارە!›.

**لجبازی** / lacbāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی]*اسم.* قیرسیچمی؛ لاساری؛ لایی؛ لابەلایی؛ سەرەخەری؛ ئینکەبەری؛ سەرشەقی؛ کەمۆتی؛ پێ‌چەقێنی؛ قین‌کێشی؛ ئاکاری دژ بە مەیل و داخوازی کەسێ بۆ بەرهەڵستی لەگەڵیدا.

▣ **لجبازی کردن**: قین‌کێشی‌کردن؛ شەرشەقی کردن؛ پێ چەقاندن؛ پا دانە گەز؛ لاساری کردن ‹خوب نیست با برادرت لجبازی کنی: باش نیە لەگەڵ براکەت قین‌کێشی بکەی›.

**لجستیک** / locestîk/: [از انگلیسی]*اسم. [نظامی]* لوجستیک؛ کۆمەڵەیەک چالاکی بۆ دابین کردنی ئەوی پێداویستیە (وەک خۆراک، جل، ماڵ)، هەروەها ئاز و گۆز و کەڵتە و سازکردن.

**لجستیکی** / locestîkî/: [از انگلیسی] *صفت.* لوجستیکی؛ سەر بە لوجستیک.

**لجن** / lacan/: *اسم.* سیلخان؛ لیتە؛ لیجە؛ لنج؛ بێرم؛ لێم؛ قیشاف؛ زلیتاو؛ لیجە؛ لەنگێز؛ لەنگێزە؛ قوڕی ڕەشی تێکەڵ بە ماکی ئالی.

▣ **لجن فعال**: لنجی زیندوو؛ لێمی زینگ؛ کۆمەڵە گیانداری زیندووی نێو سیلخان.

**لجن گواره**: لنجی پاک/ خاوێن؛ قوڕاوێ کە ڕێژەی ماکی ئالی نەخۆشیزای کەم بێ.

**لجنزار** / lacanzār ، ـها/: *اسم.* گەنکاو؛ گەناو؛ تەقەن؛ تەقن؛ جێگەی پڕ لە قوڕ و لیتە.

**لجن‌مالی** / lacanmālî/: *اسم.* ۱. لیتەمالی؛ لنج‌مالی؛ باوەڕمالی ۲. ـها/ *[کنایی]* کار یان ڕەوتی ئابڕوو بردن و ناو زڕاندنی کەسێک. هەروەها: **لجن‌مال**

**لجوج** / lacûc/: [عربی] *صفت. [ادبی]* لەنجباز؛ قڕنیس؛ چیڕ؛ نەگونجاو؛ ڕکۆ؛ ڕکن؛ ڕقن؛ ڕکەون؛ ڕکوونی؛ سەرسەخت؛ کەللەبا؛ ڕەچوکار؛ لاسار؛ گوێ‌نەبیس؛ خرس؛ سرتغ؛ گوێ‌نەدەر؛ پێ‌چەقێن؛ گەدگیر ‹آدم لجوج: مرۆی لەنجباز›.

**لج و لجبازی** / lac-o-lacbāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی]*اسم. [گفتاری]* ڕکەبەرایەتی؛ قینەبەرایەتی؛ ڕقەبەرایەتی؛ قین و قینکاری ‹از روی لج و لجبازی خانه را خالی گذاشته‌اند، نه تعمیر می‌کنند، نه می‌فروشند، نه تویش می‌نشینند: لە بەر ڕکەبەرایەتی ماڵەکەیان چۆڵ کردووە، نە کەڵتەی دەکەن، نە دەیفرۆشن، نەش تێیدەچن›.

**لچر** / lačar/: *صفت. [گفتاری]* هەرزە؛ تەرەس؛ پەست.

**لچک** / lačak ، ـها/: [ترکی]/سم. لەچەک؛ لەچک؛ لەچکە؛ لاچک؛ لەچ؛ لەچیک: ١. دەسماڵ؛ قەمتک؛ دەسرۆکە؛ سووکەڵە سەرپۆشی سێگۆشی ژنان ٢. نەخشی جوانی سێگۆش لە چوارسووچی فەرشدا: **لچکی ـ٣**

**لچکی** / lačakî ، ـها/: [ترکی]/سم. لەچەکی: ١. *[معماری]* پێکهاتەیەکی سێگۆش لە سەر کۆلەکەی ماڵ لە نێوان دوو میچدا ٢. *[معماری]* قەرنێزی ژێر شیروانی ٣. ☜ **لچک ـ٢**

**لحاظ** / lahāz, lehāz/: [عربی]/سم. ڕوانگە؛ بار؛ لایەن؛ خاڵ یان شوێنی ڕوانین.

▣ **از لحاظ**: لە باری؛ لە ڕوانگەی؛ لە لایەنی ‹ایران از لحاظ آب همیشه دچار کمبود بوده است: ئێران لە باری ئاوەوە هەمیشە کەم و کووڕی بووە›.

▣ **لحاظ شدن**: ڕەچاو بوون/ کران؛ لە بەر چاوگیران ‹این موضوع در برنامه لحاظ شده است: ئەم بابەتە لە بەرنامەدا ڕەچاو بووە›. هەروەها: **لحاظ کردن**

**لحاف** / lahāf ، ـها/: [عربی]/سم. لێف؛ لێفە؛ لێفک؛ لاف؛ نخاف؛ نخێف؛ پێخەفی گەرم لە خوری، لۆکە یان پەڕی لە تۆی پارچە خراو و دورواو.

**لحافدوزی** / lahāfdûzî/: [عربی/ فارسی]/سم. لێفەدووری؛ لێفدووری: ١. کاری دوورین و ئامادەکردنی لێفە ٢. ـها/ کارگەی لێفدوورین. هەروەها: **لحافدوز**

**لحاف کرسی** / lahāfkorsî ، ـها/: [عربی/ چینی/ ژاپنی]/سم. لێفەتەمەلە؛ لێفقورسی؛ چەکەلێف؛ لێفەی گەورەی سەر قورسی.

**لحد** / lahad/: [عربی]/سم. *[ادبی]* ١. گۆڕ؛ گلکۆ؛ قەور؛ زیارەت؛ ماڵی هەتایی مردوو ٢. گۆڕیچە؛ ئەلحەو؛ کولوە؛ کوواوە؛ تاپی؛ لەهەک؛ بنی قەبر کە تەسک بۆتەوە و مردووی تێدەنێژن ٣. کێل؛ کێلە؛ هەنگێزە؛ بەردی سەر گۆڕ.

**لحظات** / lahazāt/: [عربی] جمعِ ☜ **لحظه**

**لحظه** / lahze ، ـها؛ لحظات/: [عربی]/سم. هەناسە؛ سات؛ گڕ؛ تاو؛ هلووم؛ دەمووکە؛ چاوترووکان؛ ماوەیەکی زۆر کەم ئەوەندەی چاو لێکنانێک ‹یک لحظه غافل شدم، گذاشت فرار کرد: هەناسەیەک چاوم لێ داخست، بۆی هەڵات›.

**لحظه‌ای** / lahze'î/: [عربی]قید. بە سات؛ ساتێ؛ گڕێ؛ بە تاو؛ یەک وچێ؛ لە ماوەی یەک دەمدا ‹او لحظه‌ای تصمیم عوض می‌کرد: ئەو بە سات بڕیاری دەگۆڕی›.

**لحظه شماری** / lahzešomārî/: [عربی/ فارسی]/سم. چاوەڕوانی وێڕای بێئۆقرەیی.

**لحن** / lahn ، ـها/: [عربی]/سم. ئاهەنگ: ١. شێواز و چۆنیەتی دەنگ (قسە یان مووسیقا) ٢. //الحان/ دەنگێک بە بەرزی و نزمی تایبەتەوە ٣. دەراو؛ شێواز و شێوەی دەربڕینی بابەتێک ‹نامه‌اش لحن دوستانه‌ای داشت: نامەکەی دەراوێکی دۆستانەی هەبوو›.

**لحیم** / lahîm/: [عربی]/سم. لەحیم؛ کانزا یان ئالیاژێ کە تواوەکەی بۆ کون و کەلێن گرتن یان لکاندنی دوو کانزا پێکەوە بە کەڵک دێت.

▣ **لحیم کردن**: لەحیم‌کردن؛ کەوین؛ ڕاکوتان؛ لکاندنی دوو لەتە کانزا یان گرتنی درز و کونی کانزایەک بە لەحیم.

**لحیمکاری** / lahîmkārî/: [عربی/ فارسی]/سم. لەحیمکاری؛ کار و ڕەوتی لەحیم‌کردن.

**لخت** / laxt/: *صفت.* خاو: ١. سس؛ سست؛ نەبەگە؛ بەبێ هێزی جووڵان ٢. شل؛ شل و شەوێق؛ خۆنەگر؛ بێ‌گیان ٣. بێ‌گرژ؛ نەرم؛ بەبێ گرژی ‹موی لخت: مووی خاو›.

**لخت** / loxt/: *صفت.* ڕووت؛ ڕیت؛ ڕوهت؛ ڕویت؛ رویس؛ رووس؛ ڕوویس؛ رویچ؛ پەتی؛ تازی؛ لووت؛ لوت؛ لوەت؛ جیپ: ١. بێ‌بەرگ؛ ڕووت و قووت؛ زەلووت؛ چەک؛ چەکە؛ زت؛ ئاونیش؛ ئەفللێس؛ ڕووت و عەمەنە؛ بێ‌بەرگ و پۆشەن

‹بدن لخت، مرد لخت: لەشی ڕووت، پیاوی ڕووت› ٢. بێ گەڵا و گوڵ ‹درخت لخت: داری ڕووت› ٣. خشت و خاڵی؛ خت و خاڵی؛ هاڵی و هەوێڵا؛ ڕووت و پەتی؛ بەبێ هیچ کەلپەل و ئامرازێک ‹اتاق لخت: دیوی خشت و خاڵی› ٤. قاقڕ؛ ڕووتەن؛ ڕووتان؛ کرێن؛ بێدار یان شینایی ‹دشت لخت: دەشتی قاقر› ٥. بێ ڕووکەش یان ڕووپۆش ‹سیم لخت: سیمی ڕووت›.

▣ **لخت کردن**: ڕووت کردنەوە؛ ڕووتەوکردن؛ ڕووتەوەکەردەی؛ ڕووت کەردەیوە؛ ڕوهت کرن: ١. پۆشەن لە بەر کەسێ دەرهێنان ٢. پەرتاوتن؛ ڕووتاندنەوە؛ داڕووتاندن؛ داڕنین؛ داماڵین؛ داماڵان؛ هەڵڕووتاندن؛ هەڵپاچین؛ ڤەڕووتاندن؛ ئەرەماڵەی؛ مالایرە؛ ڤەڕوویتاندن؛ ڤەڕوویچاندن؛ ڤەڕووچکاندن؛ پەل و پۆی دارێ برین ٣. داماڵین؛ داماڵان؛ ڕووتاندن؛ ڕووتانن؛ ئەرەماڵەی؛ مالایرە؛ دار و گیای زەوینێک برین ٤. وەڕوا کردن؛ ڕووتاندنەوە؛ ڕووتاننەوە؛ ڕویت کردن؛ مالایرە؛ ئەرەماڵەی؛ هەموو شتێکی دانراو لە شوێنێک لابردن و هیچی تێدا نەهێشتن ٥. *[کنایی]* بە زۆر ماڵ و دارایی کەسێک لێسەندن ‹اول شب سە نفر ریختند سرش و او را لخت کردند: سەرەتای شەو سێ کەس بە سەریاندا داو و ڕووتیان کردەوە›.

**لختگی** / laxtegî/: *اسم.* پەلتیوی؛ مەیبوی؛ گرساوی؛ گرسیاگی؛ چۆنیەتی گرسان.

**لخت و پتی** / loxt-o-patî/: *صفت. [گفتاری، تعریض]* ڕووت و قووت؛ ڕووت و پەتی؛ ڕووت و عەمەنە؛ ڕووت و ڕویچ؛ ئاونیش؛ زەلووت؛ چەکە: **لخت و عور**

**لخت و عور** / loxt-o-'ûr/: [فارسی/ عربی] ☜ **لخت و پتی**

**لخته** / laxte/: *اسم.* جەڵتە (بۆ خوێن)؛ گرس؛ کوڵە؛ دەڵەمە؛ دۆڵەمە؛ دۆڵەمێ؛ لەگرسە؛ تراوێ کە لە بەر هەوا، سەرما یان شتی تڕەوە گرسابێ.

▣ **لخته شدن**: پەلتین؛ خۆ گرتن؛ مەیین؛ گرسان؛ گرسیان؛ گرسەی؛ گرسای؛ بەستن؛ ڤەرسین. هەروەها: **لخته بودن؛ لخته کردن**

**لختی**[1] / laxtî/: *اسم.* خاوی؛ سستی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی خاو بوون.

**لختی**[2]: *قید. [ادبی]* تاوێ؛ تاوێک؛ تۆزێ؛ تۆزێک؛ کەمێ؛ کەمێک؛ کەمێو؛ بڕێ؛ بڕێک؛ دەمووکەیەک؛ هەلێ؛ چەلێ؛ یەک تاو؛ چاوقونجانێ؛ چاوتروکانێ؛ کاتێکی کورت ‹لختی درنگ کن: تاوێک ڕاوەستە›.

**لختی**[1] / loxtî/: *اسم.* ڕووتەڵی؛ ڕووتی؛ پەتیەتی؛ ڕۆهنی؛ ڕویتی؛ ڕووت و قووتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ڕووت بوون ‹ساحل لختی‌ها: بەستێنی ڕووتەڵان›.

**لختی**[2]: *صفت. [مجازی، گفتاری]* ڕووتەڵ؛ ڕووتەڵە؛ دەسڕووت؛ بێبەرگ؛ ڕووت؛ هەژار؛ بێ ئەنوا ‹پسرەی لختی آمده خواستگاری دختر من: هەتیوە ڕووتەڵە هاتۆتە خوازبێنی کچی منەوە›.

**لخشک** / laxšak/: *صفت. [گفتاری]* ١. لەق و لۆق؛ لەق و تەق؛ لەق؛ لەرزۆک و شل ‹این صندلی لخشک است، مواظب باش نیفتی!: ئەم ئەسکەملە لەق و لۆقە، وریا بە نەکەوی!› ٢. خلیسک؛ خز؛ تایبەتمەندی جێگەی لووس: **لخشه**

**لخشه** / laxše/ ☜ **لخشک ـ٢**

**لخشیدن** / laxšîdan/: *مصدر. لازم. [قدیمی]* // **لخشیدی**: لەقای؛ **می‌لخشی**: دەلەقی؛ **بلخش**: بلەقە// لەرزین: ١. لەقان؛ لەقین؛ لەقەی؛ لەقای؛ لەق بوون؛ گێران؛ گیر بیەی؛ لە جێگەی خۆدا قایم نەبوون ٢. لەخشان؛ خزان؛ خزین؛ خزەی؛ خزای؛ خلیسکان؛ خشکان؛ تەهسین؛ شەمتین؛ لەخشای؛ خشان؛ زەلین؛ لە سەر جێی خۆ ترازان یان لەرزانەوە.

■ **صفت مفعولی: لخشیده**: (لەقاو) / **مصدر منفی: نَلَخشیدن**: *[نامتداول]* (نەلەقان)

**لـخ ــ لــخ** / lexlex/: صـوت. چەکەچـەک؛ خشـەخش؛ دەنگـی ڕاکێشـانی کـەوش یـان سەرپایی گەورە ‹با صدای لخ ـ لخ سرم را بلند کـردم و دیدم رییس است که وضو گرفتـه و دارد مـی‌آیـد: بـە دەنگی چەکەچەک سەرم هەڵـێنا و دیـتم سـەرۆکە دەسنوێژی گرتووە و خەریکە دێ›.

**لخم** / loxm/: صفت. نەرمک؛ نەرمـە؛ نـەرمۆک؛ ولمە؛ گولمە؛ پارچە گۆشـتی زلی بـێئێسـک و چەوری و ڕەگ و دەمار.

**لـذا** / lezā/: [عربی] قیـد. کـەوابوو؛ دەسـا؛ سـا؛ دەیسا؛ دەجا؛ بۆیە؛ پۆکـێ؛ پـەوکێ؛ دەجابۆیـە؛ سابۆیە؛ جابۆیە؛ ئەدی بۆیە؛ بەم بۆنەوە ‹لذا مراقب باشـید کسـی نفهمـد: کـەوابوو هۆشـتان بـێ کـەس نەزانێ›.

**لذائذ** / lazā'ez/: [عربی] ☜ **لذایذ**

**لذات** / lazzāt/: [عربی] جمعِ ☜ **لِذَّت**

**لذایذ** / lazāyez/: [عربی] /اسم. ۱. جمعِ ☜ **لِذَّت** ۲. وەشـــی؛ خۆشـــی؛ خوەشـــی؛ هـــووتی؛ خوەشیگەل؛ شـتی خـۆش یـان چێـژدار ‹لذایـذ دنیوی: وەشی دنیا› ❋ **لذائذ**

**لذت** / lezzat, lazzat ، ـها؛ لَـذّات؛ لَذایـذ/: [عربـی] /اسم. خۆشی؛ خوەشی؛ کـەیف؛ هـووت؛ لـەزەت؛ چێژ؛ تامە؛ بار و دۆخێ کـە ڕەزامەنـدی پێوەیـە ‹لـذت زنـدگی، لـذت عشـق: خۆشـی ژیـان، چێـژی ئەوین›.

⊡ **لذت بردن:** چێـژ وەرگـرتن/ بـردن؛ خۆشـی بردن؛ کەیف بردنەوە؛ لەزەت بـردن؛ خۆشـی دیتن؛ وەشی وینتەی؛ بار و دۆخێکـی خـۆش پەیدا کردن ‹سعی کـن از زنـدگی‌ات لـذت ببـری: هەوڵ بدە لە ژیانت چێژ وەرگری›.

**لذتبخش** / lezzatbaxš, lazzat-/: [عربی/ فارسی] صفت. شادیدەر؛ چێژدەر؛ هۆی خۆشی و شـادی ‹زندگی لذتبخش: ژیانی شادیدەر›.

**لذت‌جویی** / lezzatcûyî, lazzat- ، ـها/: [عربـی/ فارسی] /اسم. چێژنی؛ واز لە کەیف و خۆشی ژیـان و هەوڵ بۆ وە چەنگ خستنیان.

**لذت‌گرایـی** / lezzatgerāyî, lazzat-/: [عربـی/ فارسی] /اسم. خۆشی‌خوازی؛ چێـژوازی: ۱. بـیر و بڕوایێ کە مەبەستی ژیـن لـە خۆشـی دیـتن و دووری لە ڕەنج و تاڵەدا دەبینێ ۲. بـاوەڕ بـەوە کـە وازی سروشـتی مـرۆ (و گیانـدارانی تـریش) دەســت خســتنی چێــژ و خۆشــی و شــوێن سروشتی خۆ کەوتنە ❋ **اصالت ذات**

**لذیذ** / lazîz/: [عربی] صفت. خۆش؛ چێژە خۆش؛ بەلـەزەت؛ چـەرزە؛ خـۆش‌تـام؛ خـۆش‌چێـژ؛ خۆش‌چێژە؛ تامدار؛ بەتام ‹شام خیلی لذیـذی بـود: شێوێکی زۆرخۆش‌تام بوو›.

**لرت** / lert/ ☜ **لِرد**

**لرد** / lerd/: /اسم. [گفتـاری] تڵتە؛ بن‌گرتە؛ خڵـت: **لرت**

**لرد** / lord ، ـها؛ ـان/: [انگلیسی] /اسم. لۆرد؛ لـۆرت: ۱. ڕێزنـاوێکی ئەشـرافی بـۆ پیـاوانی بریتانیـا ۲. [مجازی] بوودە؛ زەنگون؛ زەنگین؛ پیـاوی زۆر دەوڵەمەن و دەس ڕۆیشتوو.

**لرز** / larz/: /اسم. لەرز؛ دڤـیچە؛ دڤـیچێ؛ چـۆق؛ دۆخ یان چۆنیەتی لەرزینی ماسوولکەی لـەش زۆرتر بە هۆی سەرما، ترس یان ڕکەوە.

⊡ **لرز کردن:** لەرزکردن؛ دڤیچێن؛ تووشی لەرز هاتن ‹شب لرز کردم و بعد تب و سرفه شـروع شـد: شەو لەرزم کرد و پاشان یاو و کۆکە دەسـتی پـێ کرد›.

**لرزان**[1] / larzān/: صفت. ۱. لەق و لـۆق؛ تـەق و لۆق؛ تەق و لەق؛ ناقایم؛ شـل و شـۆڵ ‹موقعیـت لرزان: دۆخی لـەق و لـوق› ۲. لـەرزۆک؛ لـەرۆک؛ لەرزەک ‹دست لرزان: دەستی لەرزۆک›.

**لرزان**[2]: قیـد. بە لەرزە؛ بە لـەرز؛ وە لـەرزە؛ لـەرە لەر؛ لەرزۆک؛ لەرزە لەرز؛ شەکان ـــ شـەکان؛ لـە حاڵی لەرزیندا ‹لرزان و گریان پیش آمد: بە لـەرزە و گریان هاتە پێشەوە›.

**لرزاندن** / larzāndan/: مصدر. متعدی. // **لرزاندی:**

لەرزاندت؛ **می‌لرزانی:** دەلەرزێنی؛ **بلرزان:** بلەرزێنە // لەرزانــدن؛ لــەرزانن؛ لەرانــدن؛ لەرزاندنــەوە؛ لەرزاننــەوە؛ لەرزنــەی؛ لــەرزنای؛ شــەکاندنەوە؛ شەکانن؛ شــەکاندن؛ ئەوەشــۆکنەی؛ شــۆکنایوە: ۱. لەراندنەوە؛ قورفاندن؛ خستنە لــەرەوە ‹لحن صدایش تمام تنم را لرزانـد: شـێوازی دەنگـی هـەموو گیــانمی لەرانــدەوە› ۲. *[مجـازی]* ڕاشــەکاندن؛ ڕاژانــدن؛ لەرنــەی؛ لــەرنای؛ وە لــەرزە خســتن؛ ڕاچاندن؛ شڵەژاندن؛ ڤەشەقاندن؛ هەڵــلەرزاندن؛ لەقاندن؛ لەقانن؛ لەق کــردن؛ لــەقنای؛ لەقنــەی؛ شــەقەتنای؛ شــەقنەی؛ شــەقنای؛ لــەقنایوە؛ ئەوەلەقنەی؛ هەژاندن؛ لەنگاندن؛ شــل و ناقــایم کردن ‹قیام مردم پایه‌های حکومت را لرزاند: ڕاپەڕینی خەڵک کۆلەکەی ڕژیمی ڕاشەکاندەوە›. هــەروەها: **لرزاندنی**

■ صــفت فــاعلی: **لرزاننــده:** (لەرزێنــەر)/ صــفت مفعولی: **لرزانده:** (لەرزێنراو)/ مصدر منفی: **نلرزاندن:** (نەلەرزاندن)

**لرزانک** / larzānak/:*اسم.* لەرزانــە؛ ژیلــە؛ ژلــە؛ خواردنێکە لە ئاومیوە، ژیلاتــین، شــەکر و شــتی بۆنخۆش کە بە داخی تــەڕە و ســارد دەبێتــەوە خۆی دەگرێ بەڵام دەلەرێتەوە.

**لرزش** / larzeš ، ـها/:*اسم.* لــەرزە؛ لــەرە؛ لەقــە؛ لاکە؛ شەکە؛ دەکــو؛ پارکــە؛ لەخشــە؛ کــار یــان ڕەوتی لەرزین ‹مدتی است دستم دچار لـرزش شـده است: ماوەیەکە دەستم تووشی لەرزە بووە›.

**لرزه** / larze/:*اسم.* ۱. لەرزە؛ لەرە ‹بـە تـنم لـرزه افتاد: لــەرزە کەوتــە گیــانم› ۲. /ــها/ بوومەلــەرزە؛ بوولەرزە.

**لــرزه‌سنج** / larzesanc ، ـــها/:*اســم.* لــەرزەپێو؛ لەرەپێو؛ کەرەسەی ئەنــدازەگرتنی ڕادەی لــەرە بەتایبەت هی بوومەلەرزە.

**لــرزه‌شناســی** / larzešenāsî/:*اسم.* لەرەناســی؛ لەرزەناسی؛ کاری توێژینەوە لەمەڕ بوومەلەرزە و لەرزەگەلی دەستکردی سەر زەوی.

**لرزه‌گیر** / larzegîr ، ـها/:*اسم.* لەرەگر؛ کەرەستە یــان پێکهاتەیــەک لــە شــتانی کێشســان (وەک فەنەر یان قایش) بۆ نەهێشتن یان کەمکردنەوەی لێدانی لەرزە و لەرەی بەشی بزۆکی دەزگایــەک لە بەشەکانی‌تر.

**لرزه‌نگار** / larzenegār ، ـها/:*اسم.* لەرزەنقــیس؛ لــەرەکێش؛ کەرەســتەیەک بــۆ ناســین و تۆمــار کــردنی شــەپۆلی لــەرزەیی، بەتایبــەت هــی بوومەلەرزە.

**لرزه‌نگاری** / larzenegārî/:*اسـم.* لەرزەنقیســی؛ کار یان ڕەوتی تۆمارکردن و دیار خســتنی ڕادە، پــەرە و لای شــەپۆلی لــەرە، بەتایبــەت هــی بوومەلەرزە.

**لرزیــدن** / larzîdan/: *مصــدر. لازم.* // **لرزیــدی:** لەرزیت؛ **می‌لرزی:** دەلەرزی؛ **بلرز:** بلەرزە // لەرزین؛ لەرزیان؛ لەرزان؛ لەرزانەوە؛ لەرزینەوە؛ لــەرزەی؛ لــەرزای؛ ئەوەلــەرزەی؛ لــەرزیایوە؛ لەخشــین؛ لــەریان؛ هەڵــوارکیان؛ ئەڵــۆرکیان؛ چرچگیــان؛ هەڵچۆقان؛ چۆقیان؛ چۆقین؛ ڕەجڤین؛ هەژیان؛ هەژان؛ هەژهان؛ لە جێگای خۆوە بە ناویســتی و لە پەستا بزوان. هەروەها: **لرزیدنی**

■ صفت فاعلی: **لرزنده:** (ـ)/ صفت مفعـولی: **لرزیده:** (لەرزاو)/ مصدر منفی: **نلرزیدن:** (نەلەرزین)

**لرگ** / larg ، ـها/:*اسم.* گوێزە جەنگەڵی؛ دارێکی جوان لە تــیرەی گــوێزە بــە چێــوی سووکەڵــە، گەڵای سەوزی گەورە و بەری بچووکەوە.

**لــزج** / lazec/: [اعربـی] *صفت.* دۆچــن؛ تــوچن؛ چەسپن؛ دەبیش؛ جلیــق؛ جلــێق؛ لیــق؛ لــیقن؛ لیلق؛ لیــنج؛ خلیچــک؛ خلیســک؛ لچــق؛ لــیچ؛ لیچق؛ مچ؛ چڤر؛ لخیز؛ لنج؛ لنچق؛ لیغیز؛ لیچە؛ لینچق؛ لینچک؛ نەرمەلیقە. هەروەها: **لزج بودن؛ لزج شدن**

**لزجت** / lazcat/: [اعربی] ☜ **لُزوجَت**

**لزگی** / lezgî, lazgî/:*اسم.* لەزگی: ۱. هــۆزێکی دانیشتووی قــەفقاز ۲. /ــها؛ ـان/ هــەر کــام لــە

خەڵکی ئەو هۆزە ٣. جۆرێک هەڵپەرکێی خێرای بە جرت و فرتەوە.

**لزوجت** / luzûat,lozûcat/: [عربی]/اسم. دۆچنی؛ چەسپنی؛ لینچکی؛ لیچقایی؛ لیچی؛ لیقی؛ لینجی؛ چۆنیەتییک لە برێ تراودا کە دەبێتە هۆی خۆ گرتن و نەڕژان، کێش هاتن و چەسپانی: **لِزجَت**

**لزوم** / luzûm, lozûm/: [عربی]/اسم. پێویستی؛ نیاز؛ ئەوەجە؛ هەڤجە؛ دۆخ یان چۆنیەتی پێویست بوون ‹در صورت لزوم کمک کنید: لە کاتی پێویستیدا یارمەتی بدەن›.

**لزوماً** / luzûman, lozûman/: [عربی]قید. بێگومان؛ بێسۆ؛ بێڕویز؛ بێ ئەولا و لا؛ ژبن؛ هاینە؛ هەم؛ هەر؛ ئێزتەرەم؛ بە شێوەی پێویست.

**لژ** / loj، ـها/: [فرانسوی]/اسم. لۆج؛ لۆژ: ١. ژوور؛ دیوێک لە تەواشاخانەدا ٢. ژووری تایبەتی ساڵۆنی سینەما و دوورترین شوێن لە پەردەوە.

**لژیون** / lej(i)yon، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پەل؛ هەنگ؛ یەکەیەکی هێزی چەکداری.

**لس** / las/: صفت. [گفتاری] چەک؛ سس؛ خاو؛ شل؛ نەبەگە؛ تورت و تازە نەماو.

**لس** / los/:/اسم. بارن؛ خاکەنەرمەی بە دەم باوە لە شوێنێک کۆمەڵ بووی بن‌گرتوو.

**لسان** / lesān، السنه/: [عربی]/اسم. [ادبی، نامتداول] زمان؛ زوان؛ زبان؛ زمانێ کە لە لایەن دەستەیەکی زمانی (وەک کورد، فارس، عەرەب، ترک یان رووس)ەوە، بۆ پێکەوە دوان و پێوەندی‌گرتن بە کار دەچێ.

**لش**[1] / laš، ـها/:/اسم. [گفتاری] لاشە؛ لەش؛ لاش؛ کەلاک ‹لش‌هاشان جلوی آفتاب بو گرفته بود: لاشەکانیان لە بەر خۆر بۆنی کردبوو›.

**لش**[2]: صفت. شەختۆ؛ تخل؛ خرس؛ ترتەپاڵ؛ پفیو؛ تەپلۆس؛ تەپلەوس؛ لەشە؛ تراڵ؛ تلار؛ منۆخ؛ تەمەڵ؛ لەش‌گران؛ ژەڵمو؛ تەوەزەل؛ سست ‹یک همچو موجود لشی را بە کمک من فرستادی؟!: ئاوا کەسێکی شەختۆت ناردۆتە یارمەتی من؟!›.

**لشاب** / lašāb، ـها/:/اسم. زەلکاو؛ زەلکە؛ ئاوی وەستاو کە تێیدا قامیش و گزرە ڕواوە.

**لشابزار** / lašābzār، ـها/:/اسم. گزرەجاڕ؛ زەلکۆ؛ زەوینی داپۆشراو بە گزرە و زەلەوە.

**لش‌بازی** / lašbāzî، ـها/:/اسم. [گفتاری] ئەڵواتی؛ ئەڵواتیی؛ خۆش ڕابوێری و کەیف و خۆشی ناشیرین و دزێو: **لش‌گیری**

⊡ **لش‌بازی درآوردن**: ئەڵواتی‌کردن؛ خۆش ڕابواردن، بە شێوەیەکی دزێو و سووک.

**لشکر** / laškar, lašgar، ـها/:/اسم. لەشکر؛ لەشکەر؛ ئەوردی؛ بتۆم: ١. بەشێ لە سپا بریتی لە سێ تیپ و یەکەی پشتیوانی ٢. هێزی چەکداری ‹لشکر کشیدن: لەشکر کێشان› ❋ **لشگر**

⊡ **لشکر کشیدن**: لەشکرکێشان؛ لەشکەر بردن؛ بردنی لەشکەر بۆ شەڕ ‹نادر شاه بە هند لشکر کشید: نادر شا لەشکری کێشا بۆ هیند›.

**لشکرشکن** / laškaršekan, lašgar-، ـان/: صفت. لەشکرشکێن؛ لەشکەربەزێن؛ زۆر ئازا و بەهێز.

**لشکرکشی** / laškarkešî, lašgar-، ـها/:/اسم. سپاڕانی؛ لەشکرکێشی؛ کار و ڕەوتی بردنی لەشکەری چەکداری بۆ شەڕ.

**لشکری** / laškarî, lašgarî، ـان/: صفت. لەشکری؛ چەکداری؛ ئەرتەشی؛ پێوەندیدار بە ئەرتەشەوە.

**لشگر** / lašgar/ ☜ **لشکر**

**لش‌گیری** / lašgîrî/ ☜ **لش‌بازی**

**لش و لوش**/ laš-o-lûš/:/اسم. [گفتاری] لات و لووت؛ لات و خوێڕی؛ خوت و خوێڕی؛ خۆڕی و تۆڕی ‹یک مشت لش و لوش دورش را گرفته بودند و برایش دست می‌زدند: برێک لات و لووت دەوریان لێ دابوو چەپڵەیان بۆ لێدەدا›.

**لطافت** / letāfat, latāfat، ـها/: [عربی]/اسم. تەڕ و بەڕی؛ نەرم و ناسکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەرم و

ناسک بوون.

**لطایف** / latāyef/: [عربی] جمعِ ☜ **لطیفه**

▣ **لطایف حیَل**: زیرەکانەترین و جوانترین چارە یان فێڵ: **لطایفالحِیل**

**لطـایفالحیـل** / latāyefolhiyal/: [عربـی] ☜ لطایف حیل، **لطایف**

**لطف** / lotf ، ـها/: [عربی]/اسم. خاسی: ١. /الطاف/ باشی؛ میهرەبـانی؛ میهـرەوانی؛ دلۆڤـانی ‹لطـف کردن: باشی کردن› ٢. خۆشی؛ چاکی ‹لطـف کـار در این بود: خۆشی کارەکە لەمەدا بوو›.

**لطفا** / lotfan/: [عربی]قید. تکایە؛ لە رووی چاکی و میهرەبانیەوە ‹لطفاً بنشینید: تکایە دانیشن›.

**لطمات** / latamāt/: [عربی] جمعِ ☜ **لطمه**

**لطمه** / latme ، ـها؛ لطمات/: [عربی]/اسم. ١. تەوەرە؛ تەمەرە؛ تەگەرە؛ پێوەر؛ گـەزەن؛ ئـازار ‹لطمـەی سیل: تەوەرەی لافـاو› ٢. وەزەن؛ وەزەنگ؛ وەزن؛ زەرەر؛ زیان لە باریماڵیەوە.

▣ **لطمـه خـوردن**: زەرەر/ زیـان دیـتن؛ ئـازار لێکەوتن؛ ئاسیو/ گەزەن پێگەیین ‹در جنگ شهر ما خیلی لطمـه خـورد: لـە شـەڕدا شـاری مـە زیانـی زۆری دیت›.

**لطیف** / latîf/: [عربی]صفت. ناسـک؛ مـەلاهیم؛ ناسک و شـلک؛ ناسـک و تەسـک؛ تـەڕ و بـەڕ؛ نەرم؛ نەرم و ناسـک؛ نـەرم و نـواڵ؛ نـارین؛ بـە چۆنیەتیەکی خۆش بە هۆی زبر، ڕەق یان تـون نەبوونەوە ‹پوست لطیف، برگ لطیـف، صـدای لطیـف: پێستی ناسک، گەڵای تەڕ و بەڕ، دەنگی نەرم›.

**لطیفه** / latîfe ، ـها/: [عربی]/اسم. تیتـاڵ؛ تیتالـی؛ تیـووڵ؛ حەنـەک؛ هەنـەک؛ پێکـەنۆک؛ نوکتـە؛ جوک؛ فشەگاڵتە؛ کوراتا: ١. /لطایف/ قسه، شیعر، بەتایبـەت چیرۆکـێ کـە بـۆ گاڵـتە و پێکـەنین دەگوترێ ٢. /لطایف/[ادبی] قسەی خۆشی مانادار بـەڵام نـەک تـاڵ ٣. شـیرینیەکی خڕکەڵـە بـە دوونانی نەرم و تۆزێک کرێم یان خامە لە توێدا.

**لعاب** / lo'āb, la'āb ، ـها/: [عربی]/اسـم. ١. لیـاوە؛ لیاو؛ لەعاب؛ لەعاو؛ تۆژاڵێ کـە لـە تواندنـەوەی شووشە بە سەر کانزا، شیشە یان سواڵەتدا بەدی دێ ٢. لیاو؛ لیقاو؛ ماکی خەستی چەسـپن کـە زۆرتر لە تواندنەوەی جەوی لە ئاودا بەرهەم دێ ‹لعاب پشت تمبر: لیاوی پشـتی تـەمر› ٣. لینجـاو؛ لیق؛ لیقاوە؛ ماکێکی ژلەیی لە نێو بـڕێ ڕوەکـدا بۆ ڕاگـرتنی ئـاو ٤. لیکـاو؛ لیگـاو؛ لیـک؛ لیـق؛ گـەلوێز؛ گلـوێز؛ لێـراو؛ لێـر؛ گـەوەل؛ لرگـاو؛ ڕینگاوی؛ ڕینگی؛ ڕینگاو؛ بـۆراک؛ گلیـز؛ گریـز؛ گرێژ؛ کەوشێل؛ توک؛ خوزاڤ؛ خەسەلیک؛ ئاوی خەسـتی دەم، بەتایبـەت هـی دەمـی بـڕێ گیانداران (وەک جاڵجاڵۆکە).

▣ **لعاب انداختن**: ڕینـگ/ لیـنج دانـەوە؛ ڕینـگ بـەردان؛ لیـاوە خسـتن؛ لینجـاو هەڵخسـتن؛ ڕینگ پێکەی؛ ڕینگانـەوە؛ لیقـاو هەڵخسـتن؛ چێ بوونی لیقاو، بەتایبەت لە تـراودا ‹بگذاریـد برنج خوب لعاب بیندازد: بێڵن برینجەکە باش ڕینگ بداتەوە›.

**لعـاب دادن**: لیـاو سـاوین/ ماڵـین/ لێـدان: ١. ئاش دان؛ ئاهار دان؛ کار و ڕەوتی داپۆشان یان جوانکاریکردنی ڕووپەڕی شتێک بە لیـاو ٢. ڕووپـەڕێک سـاف و بریقـەدارکردن (وەک ڕووی کاغەز).

**لعابـدار** / lo'ābdār, la'ābdār/: [عربـی/ فارسـی] صفت. ١. لیـاودار؛ بـە لیـاوە ٢. لیـاوی؛ ئاشـدار؛ چینکۆدار.

**لعابی** / lo'ābî, la'ābî, lā'ābî ، ـها/: [عربی]صفت. چینکۆ؛ چیمکۆ؛ لیاوی؛ ئاشدار؛ بـە پۆششـێ لـە لیاوە ‹کاسەی لعابی: کاسەی چینکۆ›.

**لعبـت** / lo'bat ، ـها؛ ـان/: [عربـی]/اسم.[مجـازی] دەلال؛ شەپاڵ؛ ژن یا کیژۆڵەی ئێجگار جـوان و لەبار.

**لعل** / la'l ، ـها/: [معرب از فارسی]/اسم.[کانیشناسی] لال؛ لـەعل؛ بـەردێکی بـەنرخ لـە ئۆکسـیدی سروشـتی ئـالومنیوم و مەنیـەزیوم بـە ڕەنگـی

سووری تۆخ و سووری ئاماڵ زەرد.

**لعن** / la'n/: [عربی] ☜ **لَعنت**

**لعنت** / la'nat ، ـها/: [عربی]/اسم. نفـرین؛ نفـر؛ تووک؛ لەعنەت: **لعن**

◘ **لعنت کردن**: تووک‌کـردن؛ نفرکـردن؛ وتـنی ئەوەی کە خوا نەیبەخشێ، سزای بدات.

**لعنتـی** / la'natî ، ـها/: [عربـی] صفت. نەلامـەت؛ بێ‌فەڕ؛ شیاوی تووک و نفـرین ‹جـۆرێ جنێـو و ناسزا›.

**لغات** / loqāt/: [عربی] جمعِ ☜ **لُغَت**

**لغاز** / loqāz/: اسم. [معماری] لاشیپانه؛ لاشـیپان؛ دیواری بنپاڵی دەرگا.

**لغایت** / leqāyat/: [عربی] حرف. تاکوو؛ هـەتاکوو؛ تـاکـەتێ؛ تاکـە؛ هـەتا: ١. تـاسـەرەتای ‹لغایـت چهارشـنبه ٢٥ فـروردین: تـاکوو چوارشـەممەی ٢٥ی خاکەلێوه› ٢. تاکۆتایی؛ تـا ئـاخری ‹لغایـت سال ١٣۶٥: تاکەتێ سالی ١٣٦٥›.

**لغت** / loqat ، ـها/: [معرب از یونانی]/اسم. ١. /لُغات/ وشه؛ واچه؛ واژه ٢. /لُغات/ وشەیێ کە مانا کـراوە یـان دەکرێتـەوە ‹لغـت معنـی: وشـەی مانـا› ٣. [قدیمی] زوان؛ زمان؛ زوبان؛ زبـان ‹لغـت مـردم کُرد: زوانی خەڵکی کورد›.

**لغت‌شناسی** / loqatšenāsî/: [معرب/ فارسی]/اسم. وشەناسی؛ لقێ لە زمان‌ناسی کە لە سەر ڕەگ و پـۆ و واتاکـانی وشـە دەکۆڵـێتەوه. هـەروەها: **لغت‌شناس**

**لغت‌نامه** / loqatnāme ، ـها/: [معرب/ فارسـی]/اسم. ١. وشـەدان؛ واژەدان؛ پـەڕاوێ کـە پـەیوینی زەمـانێکی تێـدا کۆکراوەتـەوه ٢. فەرهـەنگ؛ قامووس.

**لغز** / loqaz ، ـها/: [عربی]/اسم. لەگـەز؛ مەتـەڵ؛ لیچـار؛ پـەردەک؛ لەغـەز؛ مەتەڵـۆک؛ لۆتـەر؛ قەوسـەل؛ مامـک؛ مەتەڵـۆکە؛ تشـتەنۆک؛ تشتانۆک؛ فروسەله.

**لغز** / loqoz ، ـها/: [از عربی]/اسم. [گفتاری] زیپـک؛ تانـە؛ تـەوس؛ تەشـەر؛ تەشـەرە؛ پـلار؛ تـوانج؛ وتەیـەک مانـاهەڵـگر بـۆ سـەرکۆنە و لێگـرتنی کەسێک ‹این‌قدر لغز نگو!: هێندە زیپک لێ مەدە›.

◘ **لغـز بـار کسـی کـردن**: قسـەی سـووک لـە پارەسەنگی کەسێک نـان؛ تانـە و تەشـەر لـە کەسێک دان؛ تەوس لە کەسێ گـرتن ‹بیچـاره چقدر لغز بارش کردند: بەستەزمان چەندیان قسەی سووک لە پارەسەنگی نا›.

**لغز خواندن**: تەشەر وەشـاندن ‹شـنیدم تـو هـم پشت سرم لغز خوانده‌ای: بیستم ئەتۆش پشتەسەرم تەشەرت وەشاندووه›.

**لغـز شـنیدن**: تانـە و تەشـەر بیسـتن؛ تەشـەر لێدران؛ تەشەر لێکەوتن ‹من از این لغزها بسیار شـنیده‌ام: ئـەمن لـەم تانـە و تەشـەرانە زۆرم بیستووه›.

**لغزان** / laqzān/: صفت. خـز؛ لـووس؛ خلیسـک؛ سوڕ؛ تەهسۆک؛ خریک؛ بە دۆخ یـان چۆنیـەتی سافەوە کە دەبێتە هـۆی خـزین ‹سـطح لغـزان: ڕووپەڕی خز›.

**لغزاندن** / laqzāndan/: مصدر. متعدی. // **لغزاندی**: خزاندت؛ **می‌لغزانی**: دەخـزێنی؛ **بلغـزان**: بخزێنـه // خزاندن؛ خزانن؛ خزنەی؛ خزنـای؛ خلیسـکاندن؛ خلسـکاندن؛ خلسـاندن؛ هەڵخلیسـکاندن؛ زەلاندن؛ خریکانـدن؛ خەشـکاندن؛ تەهسـاندن؛ فشتخاندن؛ شەمتاندن. هەروەها: **لغزاندنی**

■ صفت فاعلی: **لغزاننده** (خزێنەر)/ صـفت مفعولی: **لغزانـده** (خزێنـراو)/ مصـدر منفـی: **نلغزانـدن** (نەخزاندن)

**لغزش** / laqzeš/: اسم. ڕەت: ١. لەخش؛ لەخشە؛ فسک؛ خلیسک؛ شلەپ؛ شەمت؛ سوڕ؛ لاسـوڕ؛ خشـکە؛ ڕەوتی خزیـان؛ خزکیـان؛ خلیسـکیان؛ خلیسکان ‹ترمز کردن روی یخ موجب لغزش می‌گردد: تورمز کردن بە سـەر یەخـدا ئەبێتـە هـۆی خـزان› ٢. /ـها/ [مجازی] کلا؛ کل؛ کلایی؛ لە خۆوە لاڕێ بوون ‹لغزش در زندگی گاهی جبران‌ناپذیر است: کـلا

بوون له ژیاندا برێجار قەرەبوو نابێتەوە› ۳. *[کنایی]* هەڵە؛ سەهو؛ یانش؛ ئەوەی بە دروستی بەرێوە نەچووبێ ‹در این کار کوچکترین لغزش جایز نیست: پچووکترین هەڵە لەم کارەدا ڕەوا نیە›.

**لغزش پذیر** / laqzešpazîrî/: *صفت.* هەڵەهەڵگر؛ بە توانست یان ئەگەری هەڵەکردن و کلا بوون.

**لغزندگی** / laqzandegî/: *اسم.* خزی؛ تەهسۆکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خز بوون.

**لغزنده** / laqzande/: *صفت.* خز؛ تەهسۆک ‹سطح لغزنده: ڕووبەری خز›.

**لغزیدن** / laqzîdan/: *مصدر. لازم.* // **لغزیدی:** خزای؛ **می‌لغزی:** دەخزی؛ **بلغز:** بخزە // خزان؛ خزیان؛ خزین؛ خزکیان؛ خەزتین؛ خزەی؛ خزای؛ خلیسکان؛ خلیسکیان؛ هەڵخلیسکان؛ شەمتین؛ شلەپین؛ زەلین؛ زەلان؛ چەڕخین؛ تەهسین؛ تەحسین؛ دەرەحسین؛ خریکین؛ خرکین؛ خرگین؛ خەرقین؛ حلسین؛ شلەپین؛ تەقلین؛ تەقیلین؛ چلیان؛ خشکین؛ خەشکین؛ فسکین؛ قەلزین؛ دەرحەسین: ۱. جێبەجێ بوونی ناویستی شتێ بە سەر ڕووبەرێکدا ‹لغزیدن اتومبیل: خلیسکانی ماشین› ۲. لە ناکاو تێکچوونی خۆڕاگری بە هۆی لە ژێر دەرچوونی یەک یان هەر دوو پێ ‹لغزیدن اولین علت شکستگی است: خزیان یەکەم هۆی شکانی ئێسکە›.

■ صفت فاعلی: **لغزنده** (خز)/ صفت مفعولی: **لغزیده** (خزاو)/ مصدر منفی: **نلغزیدن** (نەخزان)

**لغو** / laqv/: [عربی] *صفت.* بێهۆ؛ بێفایە؛ پووچ؛ پووچەڵ؛ بێ‌کەڵک؛ بەتاڵ؛ دەرد نەخواردگ ‹عمل لغو: کاری بێهۆ›.

⊡ **لغو شدن:** بەتاڵ بوونەوە؛ هەڵوەشانەوە؛ باتڵ بوون؛ پووچ بوونەوە؛ پووچەڵ بوونەوە؛ لە بایەخ کەوتنی دەستوور، بڕیار، قانوون یان پەسەندنامە ‹آن قانون لغو شد: ئەو قانوونە بەتاڵ بووە›. هەروەها: **لغو کردن**

**لغوی**[1] / loqavî/: [عربی] *اسم.* *[قدیمی]* ۱. زمانەوان؛ زواناس؛ زمانناس ۲. وشەنووس؛ وشەنڤیس؛ وشەوان؛ کۆکەرەوەی وشەی زمانێک.

**لغوی**[2]: *صفت.* وشەیی؛ واژەیی؛ سەر بە وشە ‹معنی لغوی: مانای وشەیی›.

**لفاظی** / laffāzî/، ـها/: [عربی] *اسم.* دەمەوەری؛ زمانبازی؛ کار و ڕەوتی کایە کردن بە وشە و ڕیزکردنی وشەی دژوار و ئاهەنگین بۆ سەرنج ڕاکێشان و شەیدا کردنی بیسەر یان خوێنەر. هەروەها: **لفّاظ**

**لفاف** / lafāf, lefāf/، ـها/: [عربی] *اسم.* لەفافە؛ تێوەپێچ؛ تێ‌پێچ؛ پێچەک؛ داپێچەک؛ دەڤەک؛ پۆشەنی دەوری شتێک بەتایبەت لە پارچە یان کاغەز: **لفافه**

**لفافه** / laffāfe/: [عربی] ☜ **لفاف**

⊡ **در لفافه فهماندن:** *[مجازی]* بە هێماوە تێگەیاندن؛ دار لەگەڵ تۆمە دیوار گوێت لێ بێ؛ بە ئاماژە و لادەمەوە حاڵی‌کردن ‹در لفافه به من فهماند که حقوقش کافی نیست: بە هێماوە تێگەیاندم مووچەکەی بەشی ناکا›. هەروەها: **در لفافه گفتن؛ در لفافه حرف زدن**

**لفت** / left/: *اسم.* لینجاو یان چەورایی بە دەفرەوە ماو.

⊡ **لفت دادن:** ۱. شێلاندن ‹لفت دادن خمیر: شێلاندنی هەویر› ۲. *[مجازی]* درێژکردنەوە؛ پێوە چوون؛ بە دەمەوە دان؛ ماتڵ کردن؛ درێژە پێدان.

**لفت و لعاب** / left-o-lo'āb, -la'āb/: [فارسی/ عربی] *اسم.* *[مجازی، گفتاری]* ئینجە و فینجە؛ تەشریفات و داب و دەستور، بەتایبەت کردەوەی زیایی و بێ‌کەڵک و کات‌کوژ.

⊡ **لفت و لعاب دادن:** ئینجە و فینجەکردن؛ بە تەشریفات و داب و دەستوورەوە چوون و ماتڵ‌کردن ‹یک استکان چای آوردن که این همه لفت و لعاب دادن ندارد: پیاڵەیەک چای هێنان

ئیدی ئەم هەموو ئینجە و فینجە کردنەی پێناویێ›.

**لفت و لیس** / left-o-lîs ، ـها/: *اسم. [مجازی]* چڵپەلێسی؛ داهاتی کەم و ناڕەوا کە چما لە ڕێی قانوونیەوە بە دەست دێت (وەک فرۆشتنی کاغەز و مقەبا بێکارەی دامەزراوەیەک و لە گیرفان نانی پارەکەی).

▣ **لفت و لیس کردن:** چڵپەلێسی کردن؛ داهاتێکی کەم لە ڕێگای ناڕەواوە چنگ خستن ‹گاهگاهی از خریدهای خانه لفت و لیس می‌کرد: جار و بارە لە شت سەندن بۆ ماڵەوە چڵپەلێسی دەکرد›.

**لفج** / lafc ، ـها/: *اسم. [قدیمی]* لەوس؛ لەپ؛ لەوچ: ۱. لچی ئەستوور ۲. دەم و لچ بەگشتی.

**لفظ** / lafz ، ـها؛ الفاظ/: [عربی] *اسم.* وشە؛ واژە؛ بێژە؛ یەکەی قسە بریتی لە یەک یان چەند برگە.

▣ **لفظ قلم:** کتێوی؛ کتێبی؛ جۆرێ قسەکردن چما نووسراو دەخوێنیەوە ‹خیلی لفظ قلم حرف می‌زد: ئێجگار کتێوی قسەی دەکرد›.

**لفظی** / lafzî/: [عربی] *صفت.* زارەکی؛ بێژەیی؛ گوتاری؛ قسەیی؛ دەمی؛ پەیڤی ‹اشتباه لفظی: هەڵەی زارەکی›.

**لف ـ لف** / loflof, laflaf/: *صوت.* ملچەملچ؛ مرچەمرچ؛ چڵەپ ـ چڵەپ؛ لەپ ـ لەپ؛ دەنگی جاوین لە دەمی پڕەوە ‹صد بار گفتم لف ـ لف غذا نخور!: سەد جار پێم گوتی لە خواردنا ملچەملچ مەکە!›.

**لف و نشر** / laff-o-našr/: [عربی] *اسم. [بدیع]* لەف و نەشر؛ هێنانی چەن وشە لە شوێنێک (لەف) و چەن وشەی‌تری سەر بەوان (نەشر) لە شوێنێکی‌تر (وەک: «هێز و سۆمای نیە باڵ و چاوم» یانێ: باڵم هێز و چاوم سۆمای نیە).

**لق** / laq(q)/: *صفت.* لەق؛ لۆق؛ لەوار؛ لەق و لەوار؛ شەق؛ بن‌بست؛ بە حاڵەت یان دۆخی ناقایم و لەرزۆک. بەرانبەر: **قرص** ‹دندانم لق شده بود، خودم آن را کشیدم: ددانم لەق ببوو، بۆ خۆم هەڵمکێشا›.

▣ **لق کردن:** جێکەن‌کردن؛ لەق‌کردن؛ لەوار کردن.

**لقا** / laqā/: [عربی] *اسم. [ادبی]* دیمانە: ۱. دیمەن؛ ڕوو؛ ڕوە؛ چار ۲. دیدار؛ ڕەوتی چاو پێکەوتن.

**لقاح** / leqāh/: [عربی] *اسم.* ۱. *[زیست‌شناسی]* ڕەوتێک لە زۆرکردنی گیا و گیانەوەران بریتی لە یەکانگیر بوونی تۆوی نێر و مێ و پێکهاتنی خانەیەکی هاوبەش ۲. *ـها/* خەرز؛ کار و ڕەوتی داکەتن؛ جووت بوونی نێر و مێ (جگە لە مرۆ).

**لقاندن** / laqqāndan/: *مصدر. متعدی.* // **لقاندی:** لەقاندت؛ **می‌لقانی:** دەلەقێنی؛ ـ// لەقاندن؛ لەقانن؛ لەقنەی؛ لەقنای؛ لەق‌کردن؛ شەقنەی.

**لقب** / laqab ، ـها؛ القاب/: [عربی] *اسم.* سەرناو؛ بەرناف؛ کەسناو؛ لەکماتک؛ پاشناو؛ پاشناف؛ ئاوەڵناوێک بۆ ڕێزنان، تیز و تیتاڵی یان پێناسەکردنی کەسێ لە جێی یان لەگەڵ ناوەکەیدا (وەک، مامۆستا خاڵ، عەلی کیمیایی، هەواس بەوەجاڕ).

**لقمه** / loqme ، ـها/: [عربی] *اسم.* پاروو؛ پاری؛ تیکە؛ لوقمە: ۱. گەیەک؛ ئەوەندەی خۆراک کە بە جارێک لە زار دەنرێ ۲. پێخوری کە لە پارچەیەک نان پێچراوەتەوە ۳. *[مجازی]* خواردنێکی کەم.

▣ **لقمه‌ی چرب:** *[کنایی]* تیکەی چەور؛ قازانج یان داهاتێکی باش کە ڕێی بۆ هەبێ ‹آرام خیال می‌کرد لقمه‌ی چرب گیر آورده و نباید از دستش بدهد: ئارام پێی وابوو تیکەیەکی چەوری گیر هێناوە و نابێ لە دەستی بدا›.

**لقمه‌ی حرام:** ۱. ماڵی حەرام؛ نانی حەرام ۲. ئەو کەسەی بابی حەرامخۆر بووبێت (جۆرێک جنێو): **حرام‌لقمه**

**لقمه‌ی کله‌گربه:** مامەحووچێ؛ تیکەی بە قەو

سەر من؛ لۆت؛ لۆتە؛ پارووی زل؛ تیکەی زل.

◘ **لقمه بزرگتر از دهان خود برداشتن:** *[کنایی]* دەست بۆ کاری گەورەتر لە ڕادە و لێهاتوویی خۆ بردن.

**لقمەی چپ کردن:** کردنە تیکەیەک؛ ڕامالین: ۱. ڕاحەت و خێرا خواردن ‹یک ران مرغ را لقمه‌ی چپش کرد: ڕانەمریشکێکی کردە تیکەیەک› ۲. *[مجازی]* بە ڕاحەتی بەزاندن ‹با او درنیفت! تو را لقمه‌ی چپ خودش می‌کند: مەچۆ ناوقەدیدا! ڕاتدەمالی›.

**لقمه را از دست کسی قاپیدن:** *[کنایی]* تیکە لە دەستی کەسێ ڕفاندن؛ کاری نزیکەو بەرهەم لە چنگی کەسێک دەرهێنان.

**لقمه را دور سر چرخاندن:** *[کنایی]* لە ڕێی هەڵەوە بۆ کار چوون.

**لقمه را هم جویدن و توی دهان کسی گذاشتن:** *[کنایی]* نانیش کردنە دەمی کەسێکەوە؛ تیکەیش بۆ کەسێک گرتن/ جاوین ‹چرا به خودت زحمت نمی‌دهی؟ مثل اینکه لقمه را هم باید جوید و توی دهان تو گذاشت: بۆ ناکەویتە خۆت؟ نەکا دەتەوێ نانیش بکەنە دەمتەوە›.

**لقمه کردن:** بابۆڵەکردن/ پێچان؛ قەپاڵە کردن/ پێچان؛ کردنە قەواڵە؛ کەردەی بابۆڵە/ قەباڵە؛ ئەنەتیکە نیەی ‹این را هم لقمه کن بگذار توی کیفت: ئەمەش بابۆڵە بکە بینە نێو جانتاکەتەوە›.

**لقمه گرفتن:** ۱. پارووگرتن؛ تیکەگرتن ‹از این کره برایت یک لقمه بگیرم؟: لەم کەرە پاروویەکت بۆ بگرم؟› ۲. *[کنایی]* قوڕ بۆ کەسێ شێلان؛ بێڕەزا و خەبەری کەسێ کارێ بۆ وی کردن کە ببێتە هۆی گیر و گرفت و تووش بوونی ‹این زن را مادرش برای او لقمه گرفته بود: ئەم قوڕە (لێرەدا ژن خواستن) دایکی بۆی شێلابوو›.

**لقمه‌ی گلوگیر بودن:** *[کنایی]* دۆشاوی زۆر خەست بوون؛ کارێکی بە ڕواڵەت بە قازانج، بەڵام جێی مەترسی بوون ‹مواظب باش! این لقمه گلوگیر است، ممکن است خفه‌ات کند: وریا بە! ئەم دۆشاوە زۆر خەستە، دوور نیە بتخنکێنێ›.

**لقمه‌ای** / loqme'î/: [عربی]/*اسم*. پارووییی؛ تیکەیی؛ وەک پاروو ‹کباب لقمه‌ای: کەواو تیکەیی›.

**لقمه‌غازی** / loqmeqāzî/: [عربی/ فارسی] ☜ **لقمه‌گازی**

**لقمه‌قاضی** / loqmeqāzî/: [عربی/ فارسی] ☜ **لقمه گازی**

**لقمه‌گازی** / loqmegāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. بابۆڵە؛ بابۆرە؛ باڵۆلە؛ باڵوولە؛ قەباڵە؛ قەپاڵە؛ مامەحووچێ؛ لوولە؛ ساندویچ؛ تیکەیێکی گەورە کە لە بەرێکەوە بە قەپاڵ دەخورێ: **لقمه‌غازی؛ لقمه‌قاضی**

**لق و لوق** / laq-o-lûq/: *صفت*. لەق و لۆق؛ تەق و لەق؛ لەق و لەوار؛ ترغەل؛ لەق و شەق؛ لەق و پەق ‹یک تختخواب لق و لوق بە من دادند کە هر لحظه می‌ترسیدم بشکند و بیفتم زمین: تەختەخەوێکی تەق و لەقیان پێم دا کە هەر دەترسام بشکێت و داکەومە خوارەوە›.

**لقوه** / laqve/: [عربی]/*اسم*. لاکە؛ ناوێکی گشتی بۆ هەموو جۆرە پەرکەمی ماسوولەیی، بەتایبەت شەپلەی پارکینسۆن.

**لقوه‌ای** / laqve'î/: [عربی] *صفت*. لاکەیی؛ تووشی نەخۆشی لاکە.

**لقی** / laqî/: *اسم*. لەقی؛ شەقی؛ جێ‌کەنی؛ جیەکەنی؛ دۆخ یان چۆنیەتی لەق بوون.

**لقیدن** / laqqîdan/: *مصدر. لازم [گفتاری]* لەقین؛ لەقان؛ لەقەی؛ لەقای؛ شەقەی؛ لەق بوون ‹این میز از همان روز اول می‌لقید: ئەم مێزە هەر لە ئەوەڵ ڕۆژەوە دەلەقی›.

■ صفت مفعولی: **لقیده**: (لەقاو)/ مصدر منفی: **نلقیدن**: (نەلەقین)

**لک** / lak/:/اسم. لەک: ١. /ـها/ لەکە؛ پەڵە؛ پنۆ؛ پنوو؛ پنۆک؛ قانی ٢. تیتۆڵ؛ بزگوڕ؛ تیتڵە؛ تیتاڵ؛ تیتوو؛ ڕندۆڵ؛ پرچک؛ پرتۆک؛ تێتڵە؛ پرتاڵ؛ پرتۆڵ؛ قەرپاڵ؛ قەرباڵ؛ کەیەنەک؛ شندڕ؛ گنج یان پارچەی شڕ و وڕ ٣. شرم ـــ بڕم؛ کەترەیی؛ هاتەران‌پاتەران ٤. [سنسکریت] سەدهەزار؛ سەت‌هەزار؛ سەد.

▣ **لک افتادن**: پەڵە/ لەکە تێکەوتن؛ پەڵە/ لەک هەڵگرتن؛ لەکەدار بوون؛ لەکەگیرتەی؛ لەکە کەوتەی ‹دست به آینه نزن، لکه می‌افتد: دەست لە ئاوێنەکە مەدە، پەڵەی تیدەکەوێ›: **لک شدن**

**لک زدن دل کسی** ☜ دل کسی برای چیزی لک زدن، **دل**

**لک شدن** ☜ **لک افتادن**

**لک کردن**: پەڵە تێخستن؛ پیس کردن؛ لەکەدارکردن ‹باران شیشه‌ها را لک کرد: باران پەڵەی خستە شیشەکانەوە›.

**لکات** / lakāt/:/اسم. لەککات؛ پەڕەیەکی قومار بە نەخشی ژنێکی لەڤەند.

**لکاته** / lakkāte ، ـها/: صفت. لەککاتە؛ لەیلەدۆنێ؛ خوێنەونێرە؛ خوێنەونەرە؛ سەڵیتە؛ قەرەچی؛ ژنی بێ‌شەرمی شەڕانی.

**لکدار** / lakdār ، ـها/: صفت. لەکەدار؛ پەڵاوی؛ بە پەڵە؛ لەکەین؛ خاڵخاڵە؛ پنۆکدار؛ قانی‌دار؛ بە خاڵ و پەڵەوە ‹یک مشت سیب پلاسیده و لکدار آورده بود: هێندێک سێوی سیسیاو و لەکەداری هێنابوو›.

**لکلک** / laklak/: [اکدی]/اسم. حاجی‌لەق‌لەق؛ هاجی لەکلەک؛ حاجی‌لەی‌لەک؛ حاجی‌لەگ‌لەگ؛ لەق‌لەق؛ لەگ‌لەگ؛ ئلرگ؛ حللێر؛ باڵدارێکی سپی و ڕەشی زۆر لنگ و دندووک درێژە کە لە ئاوەدانیدا هێلانە دەکا، مار و ماسی و بۆق دەخوا، گەرمێن و کوێستان دەکا و گۆشتی ناخورێ.

**لکلکه** / lekleke/:/اسم. ئاژینە؛ چەقەنە؛ چەقچەق؛ چەقچەقە؛ چەقچەقۆک؛ چەقێنە؛ تەقتەقۆک؛ تیقینە؛ چەرەخۆرە؛ بریتییە لەو دار یان لوولەیە لە ئاشدا کە بەستراوە بە کەویجەکەوە و لە کاتی گەڕانی بەرداشدا وردە ـــ وردە دان دەوەرێنێتە ناو گەرووی بەرداشەوە.

**لکن** / lāken/: [عربی] حرف. بەڵام؛ بەلان؛ بلان؛ بلام؛ ئەمما؛ لابرێ؛ لابنێ؛ لابەلێ؛ وەلێ؛ وەلێکان؛ وەلێکانێ؛ وەلێکەتێ؛ ئەمان ‹همه را دوست دارم لکن تو را از همه بیشتر: هەمووم خۆش دەوێ بەلام تۆ لە گشت زۆرتر›: **لاکن؛ لیک** [مخفف]: **لیکن**

**لکنت** / loknat/: [عربی]/اسم. توری؛ تری؛ گەی؛ تک‌زووانی؛ نەخۆشیەک لە قسەکردندا کە بە ئەستەم دەربڕینی وشە، دووپات بوونەوەی برگەکان و کێش هاتن و کول بوون لە دەربڕینی برێکیاندا خۆ دەنوێنێ: **لکنت زبان**

▣ **لکنت زبان** ☜ **لکنت**

▣ **لکنت داشتن**: تور بوون؛ تر بیەی.

**به لکنت افتادن**: تور بوون؛ کەوتنە توری؛ کەوتنە پرتەپرت؛ تووشی گرفت بوون لە قسە کردندا.

**لکنته** / lakante/: صفت. لەکارتە؛ لە کارکەوتە؛ کوخار؛ پەک‌کەوتوو ‹ماشین لکنته؛ بخاری لکنته: ماشینی لەکارکەوتە؛ کوورەی لەکارتە›: **لکنتی**

**لکنتی** / lakantî/ ☜ **لکنته**

**لک و پیس**[1] / lak-o-pîs ، ـها/:/اسم. [گفتاری] پەڵە و لەکەی ناشیرین و ناحەز.

**لک و پیس**[2]: صفت. بە پەڵە و لەکەی ناشیرین و ناحەزەوە.

**لک و لک** / lek(k)-o-lek/:/اسم. لەقەلەق؛ شنەشن؛ سنەسن؛ مسەمس؛ سەورەسەور؛ ساناسانا؛ سنگەسنگ؛ خاوەخاو؛ خنەخن ‹لک‌ولک راه رفتن: لەقەلەق چوونە ڕێدا›.

▣ **لک‌و لک کردن**: مووشەمووش‌کردن؛ خۆ بە

هیچ و پووچەوە خلافاندن.
**لکوموتیو** / lokomotîv ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. لوکۆمۆتیو؛ پێڕاگوێزێکی موتوری کە بە سەر هێڵی ئاسندا دەڕوا و ڕیزێک واگونی قەتار لە دووی خۆی ڕادەکێشێ: **لوکوموتیو**
**لکوموتیوران** / lokomotîvrān ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. لێخوڕی قەتار؛ قەتارئاژۆ.
**لکه** / lakke ، ـها/:اسم. پنۆ؛ پنۆک؛ پنوو؛ قانی؛ پەڵە؛ خاڵ؛ لەک؛ لەکە؛ لکە؛ پڵ؛ پەنی: ۱. بەشێ لە ڕووبەرێک کە بە هۆی پیس بوونەوە ڕەنگی گۆڕابێ ‹لکەی سیاهی روی کاغذ افتاده بود: خاڵێکی ڕەش کەوتبووە سەر قاقەزەکە› ۲. شوێنەواری پیسی ‹لکەی جوهر: پەڵەی جۆهەر› ۳. ڕەنگ گۆڕاوی خاڵێ لە شتێک ‹زیر چشمش لکەی کبودی دیده می‌شد: لە ژێر چاویدا پەڵەیەکی شین دەبینرا› ٤. *[مجازی]* مۆر؛ بەدناوی؛ مایەی سەرشۆڕی.
▣ **لکەی زرد:** *[کالبدشناسی]* خاڵی زەرد؛ خاڵێک لە تۆڕینەی چاودا کە سۆمای لە هەموو شوێنەکانی‌تر زۆرترە.
**لکه دار** / lakkedār/: صفت. پەڵەدار؛ لەکەدار: ۱. پنکە-پنکە؛ پەڵە-پەڵە؛ پەڵاوی؛ بە پەڵە؛ پەڵەپەڵاوی؛ لەکەین ۲. *[مجازی]* ئابڕووتکاو؛ بەدناو؛ ناوزڕاو. هەروەها: **لکەدار شدن؛ لکەدار کردن**
**لکەگیری** / lakkegîrî/:اسم. لەکەگری؛ پنۆسڕی؛ پەڵەسڕی؛ لەک پڕوگرتی؛ کار یان ڕەوتی سڕین و لابردنی پەڵەی سەر شتێ.
**لگاریتم** / logārîtm ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. *[ریاضی]* لوگاریتم؛ دروشمێک بۆ نیشاندانی جاری چەندپاتە بوونەوەی ژمارەیەک بۆ بەرهەمهاتنی ژمارەیەکی تر ‹۲، لگاریتم ۱۰۰ بر پایەی ۱۰ است: ۲ دەکاتە لوگاریتمی ۱۰۰ لە پایەی ۱۰دا›.
**لگام** / legām ، ـها/:اسم. *[ادبی]* هەوسار؛ ئەڤسار؛ لەغاو؛ لغاو؛ لخاو؛ لغاڤ؛ لەفاف؛ لخاف؛ لخاڤ؛ لەخاڤ؛ لەخاف؛ لەخام؛ لەخۆم؛ لەقام؛ لقاو؛ لەقاو؛ لیغاب؛ گەم؛ گەمک؛ جلەو؛ لیوان؛ دەڤگەم؛ دەزگین؛ دەسگین؛ ئامرازێکی لە چەرم و ئاسنە دەخرێتە دەمی ئەسپی سواریەوە.
**لگد** / lagad ، ـها/:اسم. ۱. لەقە؛ لەقێ؛ لەغە؛ لەخە؛ لۆق؛ پێ‌لەقە؛ شەقە؛ شەق؛ شاق؛ پێلاقە؛ لاقە؛ شەقچەڕ؛ چەڕ؛ پەخین؛ لووشکە؛ زیتک؛ زیچ؛ پێهن؛ شاپ؛ شەپ؛ پێن؛ جیفرکە؛ جیفرک؛ زیتک؛ جووتە؛ لووشک؛ زیترک؛ جۆحتک ۲. لەقە؛ تەکان؛ بەرەودوا چوونەوەی تۆپ و تفەنگ لە کاتی تیر هاویشتندا.
▣ **لگد انداختن:** جووتە وەشاندن؛ لووشک هاوێژتن؛ لەقە وەشاندن؛ لەقە لێدان؛ لەقە وەشانن؛ چرتک هاڤێتن؛ لەق شەی؛ لەق شای؛ لاق بە توندی ڕاوەشاندن بۆ لێدان ‹مواظب باش! این اسب چموش است، لگد می‌اندازد: هۆشت بێ! ئەم ئەسپە تووشە، جووتە دەوەشنێ›: **لگد پراندن**
**لگد به بخت خود زدن:** *[مجازی]* شەق لە بەختی خۆ هەڵدان؛ شەق بە بەخت خۆدا دان؛ شەق لە ناو چاوان خۆ هەڵدان؛ هەلی باش لە کیس خۆ دان ‹این فرصت را از دست نده، چرا لگد به بخت خودت می‌زنی؟: ئەم هەلە لە دەس مەدە، بۆ شەق لە بەختی خۆت هەڵدەدەی؟›.
**لگد پراندن** ☜ **لگد انداختن**
**لگد خوردن:** لەقە/ شەق لێدران؛ پەی‌کەوتەی؛ بە هۆی پاوە زەرپ لێ کەوتن ‹لگد خورد به شـ مش افتاد روی زمین: لەقە دای لە زگی کەوتە زەوی›.
**لگد زدن:** لەقە لێدان/ وەشاندن؛ لەق داونەی ‹اسب لگدش زد: ئەسپ لەقەی لێدا›.
**لگد کردن:** پا پێدا نان؛ پێ بە شتێکدا نان؛ خستنە ژێر پێ ‹مواظب باش بچە گربە را لگد نکنی!: هۆشت بێ پا بەچکە پشیلەکەدا نەنیی!›.

**لگدپرانی** / lagadparānî ، ـها/: *اسم.* جووتە/ جفتە/ لووشکە هاوێژی: ١. کاری هەڵخستنی پا بۆ لەقە وەشاندن ٢. *[مجازی]* سەربزێوی؛ نافەرمانی؛ لاساری؛ سەرشەقی ‹داشت لگدپرانی می‌کرد، بیرونش کردم: خەریک بوو سەربزێوی دەکرد، دەرم‌کرد›.

**لگدکوب** / lagadkûb/: *صفت.* لەقەشێل؛ پاشێل؛ پێ‌پەست؛ پاپەست؛ پاکوت؛ پێ‌کوت؛ پاولاین؛ سمکوت؛ لەقەکوت؛ پێهن‌کوت؛ پێلاقەکوت؛ پێلەقەکوت؛ لۆق‌کوت؛ چەڕکوت؛ وەبەر لەقە کەوتوو.

▣ **لگدکوب شدن:** پەلخان؛ پەلخین؛ پاشێل بوون؛ پێ‌خوست بوون؛ لەقەکوت بوون؛ پێ‌پەست بوون؛ پاپەست بوون؛ پان و فلچ بوونەوە لە ژێر پادا ‹بسیاری زیر پا لگدکوب شدند: زۆرێک لە ژێر پێدا پەلخان›.

**لگدمال** / lagadmāl/: *صفت.* تەپس؛ پاشێل؛ بە پاکوتراو؛ بەر پێ دراو؛ پێخوس؛ پێخوست؛ لەقەشێل؛ لەقەکوت؛ پێهن‌ماڵ؛ لەقەماڵ؛ تلیساو؛ پانەوبووگ و لە کیس چوو بە هۆی زەربی پێوە.

▣ **لگدمال شدن:** پێ‌شێل بوون؛ پاشێل بوون؛ پێ‌خوست بوون؛ پێهن‌ماڵ بوون: ١. وە ژێر پا/ لەقە کەوتن ‹همەی کتاب‌ها و تابلوهای نقاشی زیر پای مهاجمان لگدمال شدند: کتێب و تابلۆی نیگارکێشی، هەموو لە ژێر پێی داگیرکەراندا پێ‌شێل بوون› ٢. *[کنایی]* سووکایەتی پێ کران؛ سووک و بێ‌ڕێز بوون یان تیاچوون ‹قانون و عدالت لگدمال شد: قانوون و دادپەروەری پاشێل بوو›. هەروەها: **لگدمال کردن**

**لگن** / lagan ، ـها/: [از بابلی] *اسم.* لەگان؛ لەنگان؛ لەگەن؛ لگ؛ گرمگە: ١. قاپی خڕی گەورە بە لێواری هەڵگەڕاوەوە بۆ شت تێدا شۆردن ٢. گوڵدان؛ گولدانک؛ گولدێن؛ دەفری میز تێکردنی نەخۆش و منداڵ ٣. هەموو پێکهاتەیەکی وا ‹لگن ظرفشویی: لەگەنی دەفرشۆری›.

▣ **لگن خاصره:** *[کالبدشناسی]* کزیە؛ کاسیلە؛ کاسیلکە؛ کاسەی سمت؛ قای؛ دوقایێ؛ گۆلمگ؛ کاسەی ئێسکی سمت کە لە پێکەوە لکانی ئێسکی سێ‌بەندە و هێت پێک دێ و مێزەڵدان، ڕیخۆڵە و ئەندامانی زاوزێی تێدایە.

**لگن ظرفشویی:** گولدێن/ لەگەنی دەفرشۆری؛ کاسەی گەورەی کانزایی بەر شێری ئاو بۆ دەفر شوتن.

**لگن مستراح:** کاسەمەبال؛ کاسەدەساو؛ سەنگ مەستراو؛ کاسەی سەر چاڵی دەستاو کە لە سەری دادەنیشن.

**لگنچە** / laganče ، ـها/: [از بابلی/ فارسی] *اسم.* کاسۆڵە؛ کاسەڵە: ١. گولدێنی بچووک؛ لەگانی بچکۆلە ٢. *[کالبدشناسی]* لوولەیەکی وەک ڕەحەتی لە قووڵکایی گورچیلەدا کە میزنای پێوە دەلکێ.

**لگن‌شور** / laganšûr ، ـها/: [از بابلی/ فارسی] *اسم.* *[گفتاری]* لەگان‌شۆر؛ گولدێن‌شۆر: ١. کەسێ کە کاری شوتنی گولدێنی دەساوە ٢. کەرەستەی شوتنی گولدێن، بریتی لە میلەیەکی درێژ، برۆسێکی گەورەی زبر و پڕ بە سەریەوە.

**لگنی** / laganî/: [از بابلی] *صفت.* لەگانی: ١. گولدێنی؛ گولدانکی؛ وەک گولدێن ‹کلاە لگنی: کلاوی گولدێنی› ٢. لەگەنی؛ سەر بە کزیە و کاسەی سمت ‹کمربند لگنی: پشتێنەی لەگانی›.

**لگو** / lego ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* لیگۆ؛ جۆرێک ئامرازی گەمە لە پارچە ـ پارچەی چێو، کانزا یان بەتایبەت پلاستیک، لە تەشک و ڕەنگی جۆراوجۆردا کە بە پاڵ‌یەک نان و ڕێکخستنیان لێسۆکی جۆراوجۆر (وەک ماڵ، ماشین، پاپۆڕ و...) دروست دەبێ.

**لگوری** / lagûrî ، ـها/: *صفت.* *[مستهجن]* کۆنەفرتۆڵ؛ پیرەقرچۆڵ؛ ژنەخراپەی پیر و درزێو.

**للگـــی** / lalegî/:*اســم.* لەلــەیی؛ لەلایــەتی؛ لەلەیەتی؛ کار و پیشەی ئاگاداری لە مندالان.

**للــه** / lale ، ـهـا/:*اسـم.[قـدیمی]* لەلـە؛ لیلـە؛ سەرپەرشتی زارۆکان؛ پیاوێ کە لە مالاندا ئاگای لە مندالان دەبوو.

**لم** / lam/:*اسم.* مرک؛ لەم؛ کاری شان داهێنـان و پاڵ دانەوە.

▣ **لـم دادن**: ڕۆکـەوتن؛ شـان داهـێلان؛ پـاڵ لێدانەوە؛ پالۆدان؛ پشت لێدانەوە؛ لەمـەوداین؛ پالەوەدەی؛ پالدانەوە و لاق ڕاکێشان.

**لم** / lem(m)/:*اسم.* فەن؛ فووت؛ فـووت و فـەن؛ ڕێکار و شێوەی تایبەتی کارێک.

**لمبانـــدن** / lombāndan, lonbāndan/:*مصـــدر. متعدی.[گفتاری]* // **لمباندی**: هەلتخست؛ **می لمبانی**: هەلــدەخەی؛ **بلمبــان**: هەلــخە// هەلخســتن؛ لرفانـدن؛ خەپرانـدن؛ هەبشـاندن؛ هەلـمەقووت کردن؛ داپەچنین؛ بـە هەلـپە و پەلـە خـواردن. ‹یک بشقاب پلو لمباندی، هنوز سیر نشدی؟!: دەورێک پلاوت هەلخست، هێشتا تێر نەبووی؟!›: **لنبانـدن**؛ **لمبانیدن**. هەروەها: **لمباندنی**

■ صفت مفعولی: **لمبانده** (هەلخراو)/ مصـدر منفی: **نَلمباندن** (هەلنەخستن)

**لمبانیدن** / lomānîdan/ ☜ **لمباندن**

**لمبـر** / lambar/:*اسم.[گفتـاری]* تـەکان؛ لـەرزە؛ لەرە؛ لەپ؛ شەقە؛ شـەپە؛ چۆنـاوچۆنی شـەپۆل دان یا لەراندنەوەی شتێ.

**لمبر** / lombar ، ـها/:*اسم.[گفتاری]* تەتک؛ سمت؛ سمتۆل؛ لاقوون؛ لاقین؛ لاعن؛ هەر کام لـە دوو ولمەی خواری کەمەر.

**لمس**[1] / lams/: [عربی]*اسم.* کاری دەست لێدان/ لێخستن/ پێـدا هێنـان/ پێداماڵـین/ ڕێخسـتن/ ساوان؛ تلانن؛ دەست ساوین بە شـتێکدا ‹لمس کردم خیلی زبر بود: دەستم لێدا زۆر زرۆ بوو›.

**لمس**[2]: *صفت.[گفتاری]* گـەپۆل؛ لـەپۆل؛ لـەمس؛ شەپلە لێدراو؛ ئیفلیج ‹دستش لمس شـده بـود، کـار نمی‌کرد: دەستی گەپۆل ببوو، کاری نەدەکرد›.

**لمف** / lamf/: [فرانسوی] ☜ **لنف**

**لمفی** / lamfî/: [فرانسوی] ☜ **لنفی**

**لمیـــدن** / lamîdan/: *مصـــدر. لازم.* // **لمیـــدی**: ڕۆکـەوتی؛ **مـی‌لمـی**: ڕۆدەکـەوی؛ **بلـم**: ڕۆکـەوە// ڕۆکەوتن؛ شان داهێلان؛ تخێل بوون؛ لەمدیە؛ بۆ حەســانەوە، پـاڵ دانــەوە و لاق درێژکــردن.

هەروەها: **لمیدنی**

■ صفت مفعولی: **لمیده** (ڕۆکـەوتوو)/ مصـدر منفـی: **نَلمیدن** (ڕۆنەکەوتن)

**لم یـزرع** / lamyazra'/: [عربـی] *صفت.* ۱. قاقـڕ؛ قراج؛ ڕووتەن؛ دەغ؛ ڕووتەلان؛ ڕووتال؛ ڕووتـان؛ ڕووتانی؛ ڕووتەنی؛ بوور؛ بـێ گـژ و گیـا؛ بـێ‌ئـاو؛ وشک و بـێ‌ئـاو ‹بیابان لـم‌یـزرع: دەشـتی قاقـڕ› ۲. بایەر؛ باهێر؛ بەیار؛ بۆرە؛ بـوورە؛ بیـور؛ دهـم؛ سهر؛ نەڤەکری؛ نەکێلدراو ‹زمین به ایـن خـوبی را لـم‌یـزرع انداختـه رفتـه شـهر!: زەوی وا باشـی بایـەر هێشتۆتەوە و ڕۆیوە بۆ شار!›.

**لنباندن** / lonbāndan/ ☜ **لمباندن**

**لنبه** / lombe, lonbe/: *صفت.* ولمە؛ خەپە؛ خرپە؛ خرپن؛ خرپنە؛ خەپانە؛ خەپلە؛ خەپەرە؛ خەپەلە؛ خەپەلە؛ خەپەلی؛ خەپەلانە؛ خەپەتۆلە؛ خـەپ؛ خڕ و مڕ؛ خشپن؛ خڕ و پـڕ؛ مەنـدین؛ قولـەبنە؛ خڕکەلـە؛ گـردەڵ؛ گردەلانـە؛ گردەلـە؛ خـڕ و گۆشتن.

**لنت** / lent ، ـهـا/: [روسـی]*اسم.* شـریتە؛ نـەوار؛ لینت؛ تیزمالک.

▣ **لنت ترمز**: لینتی تـورمز؛ چێوپەمەئاسایەکی زۆر پتـەو بـە شـێوەی نیوەجـەغزێک بـۆ بـە چەرخەوە لکان و ڕاگرتنی ماشێن.

**لن ترانی** / lantarānî ، ـها/: [عربی]*اسم.[گفتـاری]* قسەی ڕەق؛ قسەی تاڵ؛ تەوس و تـوانج؛ تانـە و تەشەر.

▣ **لن ترانی خوانـدن**: زمانتالـی‌کـردن؛ قسـەی ڕەق/ تاڵ کردن؛ تانە و تەشەر لێدان؛ تـەوس

و توانج تێگرتن ‹این دسته گل را به آب داده‌ای، لن‌ترانی هم می‌خوانی؟!: ئەم پەنتە داوە، زمانتاڵیش دەکەی؟!›. هەروەها: **لن‌ترانی بار کسی کردن**

**لنتو** / lantû/: *اسم. [نجاری]* میلە یان تەختەی سەر دوو لاشیپانەی دەرگا و پەنجەرە. بەرانبەر: **پاسار**

**لنج** / lenc ، ـها/: [از انگلیسی] *اسم.* لـنج؛ لۆتکـەی گەورەی موتوری.

**لند** / lond/: *اسم.* بۆڵە؛ ورتە؛ پرتە؛ ورت؛ ڕینگـە؛ بۆڵەبۆل؛ پرتە و بۆڵـە؛ لـووت و پـووت؛ خوتـە و بۆڵە؛ پت ـ پـت؛ پتـەپت؛ پندەپنـد؛ مرتـەمرت؛ گۆتەگۆت؛ جرتـەجرت؛ خوتـەخوت؛ پرتـەپرت؛ پندە؛ فرتە؛ فنەفن؛ لووتـە لـووت؛ ڕینگـەڕینگ؛ قسـەی هێـواش و لـە ژێـر لێوانـەوە بـۆ گلـە و گازندە: **لندولند**

**لنـــدوك** / landûk ، ـهـا/: *صـفت.* حـــۆل؛ درێژداهۆل؛ شەتەخار؛ درێژکەلـە؛ درێژەڵـە؛ دار واوەیلا؛ درێژ و لەڕ.

**لندولند** / londolond/ ☜ **لُند**

**لنـدهور** / landehûr, landahûr ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* حەیتە؛ حەپـەنتی؛ حەپـەنگ؛ حـەپۆل؛ زەبـەلاح؛ زەبـەلۆح؛ گـەلحۆ؛ نێـرە؛ نێـرەزەلام؛ زڕتــەزەلام؛ زەب؛ زەبزەبــە؛ بــاقوڕە؛ ئابۆنــە؛ زلحورت؛ زەگوردە؛ زەگزەگە؛ زلحـۆ؛ زلحـۆرت؛ زەگەردوگ؛ قەبە؛ گەلۆر؛ گەلۆرە؛ حوت؛ هـەلفۆ؛ گۆپـۆ؛ تـەژە؛ دەگەنــەک؛ نهیتــەک؛ لاهــۆرە؛ گەوەزە؛ قۆـ قۆ؛ لەندەهۆر؛ فیلەندەر؛ فیلۆ؛ کەتە؛ کەلان؛ پۆس‌پەنیر؛ زرت؛ زڕتک؛ زرتە زەلام؛ بم؛ ترتـرە؛ چوارهـەنگڵ؛ چوارهـەنگوڵ؛ نـەترەبـۆق؛ لاهێر؛ زرتەبۆز؛ مەندەبۆر؛ مەنـدەبوور؛ نافرەجـا؛ لۆزەنـدەر؛ بلەزەنـدەر؛ چەتـەوول؛ کێـران؛ زڕ و زەلام؛ زلی بێکـارە و خوێـڕی ‹مردیکـەی لنـدهور خجالت نمی‌کشد بچـەی همسایەشان را کتـک زده: کابرای حەیتە داناڕزێ لە منداڵی جیرانەکەی داوە›.

**لندیـدن** / londîdan/: *مصـدر. لازم.* // **لندیــدی:** بۆلاندت؛ **مـی‌لـنـدی:** دەبۆڵـێنی؛ **بلـند:** ببۆڵـێنە // ۱. بۆلاندن؛ بوولان؛ بۆڵـنەی؛ بۆڵـنای؛ پرتـە و بۆڵە کردن؛ ورتەورت‌کردن؛ لووشـکان؛ لـە بـەر خۆوە بـۆ گلـە و شـکات قسـەکردن ۲. *[قـدیمی]* بافیش کردن؛ هەڵشلنگاندن؛ هەڵشنگاندن؛ خۆ هەڵکێشان؛ شات و شووت کردن.

**لنز** / lenz ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* لنـز: ۱. *[فیزیـک]* نیسکە؛ لێنـز؛ نیسـکۆک؛ لەتـە مـاکێکی ڕوونی یەک یا هەر دوو لا کەوانەیی، کـە بـە لێـدرانی دەستە تیشکێکی هاوشان، تیشکەکان پێک کۆم یان لێک بلاو دەکاتەوە ۲. نیسـکۆکی ناسـک و ڕوون لە پلاستیک یان شیشە کە بۆ باشتر دیتن یان گۆڕانی ڕەنگی چاو لە سەر گلێنـەی چـاوی دەنێن: **کنتاکت‌لنز**

**لنف**/ lamf, lanf/: [از فرانسوی] *اسم. [زیست‌شناسی]* لەنف؛ تراوی زەرد یـان بـێ‌ڕەنگـی نێـو ڕەگـی لەنفی کە لە مووڕەگەکانەوە دەدەڵـێت و تـەنیا گلوبوولی سپی هەیە: **لمف**

**لنفاوی** / lamfâvî, lanfâvî/: [از فرانسـوی/ عربـی] *صفت.* لەنفی: ۱. سەر بە لـەنف ‹دستگاه لنفـاوی: کۆئەندامی لەنفی› ۲. هەڵگری لەنف ‹رگ لنفاوی: ڕەگی لەنفی› ✻ **لنفی**

**لنفوسیت** / lamfosît,lanfosît ، ـها/: [از فرانسوی] *اسم. [زیست شناسی]* لەنفوسیت؛ جۆرێک گلوبوولی سپی کە لە لووی لەنفی، سپڵ و ئاڵوودا دروست دەبێ.

**لنفی** / lanfî/: [از فرانسوی] ☜ **لنفاوی: لمفی**

**لنگ** / lang/: *صـفت.* لـەنگ: ۱. شـەل؛ قرنـگ؛ چـوور؛ قلـۆپ؛ مڤـرۆ؛ شـەلە؛ شـلە؛ کولـەک؛ کوولەک؛ کوللەک؛ لەنگر؛ پالـەنگ؛ پـا سـەقەت ۲. مەحتــەل؛ تــەق و لــەق؛ دەستەوســان؛ ڕاوەستاوی کار لـە بـەر کـەم و کـووڕی ‹نبودن وسـیلە کارمـان را لنـگ کـرد: نـەبوونی کەرەسـتە کارەکەمانی مەحتەل کرد› ۳. داماو؛ داماگ؛ تەق و لەق؛ دەرمەنە ‹حقوقش را قطع کردەانـد و بـرای

خرج زندگی لنگ است: مووچەکەیان لێبڕیوە و بۆ بژیوی ژیانی داماوە›.

▣ **لنگ چیزی شدن:** مەحتەلی شتێ بوون؛ دەستەوسان مان/ بوون بۆ شتێک؛ دەستەوسانی شتێک بوون/ مان؛ تەق و لەقی شتێک بوون؛ لەنگی شتێ مانەوە؛ بە بۆنەی نەبوونی شتێ لە کار مانەوە ‹مدتی لنگ ماشین شدیم، بعد هم توی راەبندان گیر کردیم: ماوەیەک مەحتەلی ماشین بووین، دواییش لە ڕێبەنداندا گیرمان کرد›. هەروەها: **لنگ ماندن**

**لنگ زدن:** لەقین؛ لەنگ لێدان؛ والەکردن؛ باش نەسووڕانی تەگەرە ‹چرخ عقب لنگ می‌زند: تەگەرەی پشتەوە ئەلەقێ›.

**لنگ کردن:** ١. پا سرەواندن؛ درەنگکردن؛ پێ ڕاگرتن؛ وەستانەوە؛ ئێس‌کردن ‹قدری لنگ کردیم که بقیه هم برسند: هێندێ پامان سرەواند هەتا باقیش بگەن› ٢. دێرکردن؛ درەنگکردن؛ بوونە هۆی دێری و دواکەوتن ٣. مانەوە؛ مەنایوە؛ زیاتر لە ماوەی پێویست یان چاوەڕوانیکراو پێچوون ٤. لەنگکردن؛ فەلەجکردن؛ لەنگ تێخستن؛ بوونە هۆی وەستانەوە و فەوتان.

**لنگ گذاشتن:** دەسەپاچەکردن؛ لەنگ هێشتنەوە؛ کشکشاندن؛ لە کاتی پێویستی و داماویدا بە جێهێشتن و دەستەوسانکردن ‹دیروز نیامدی و ما را لنگ گذاشتی: دوێنێ نەهاتی و دەسەپاچەت کردین›.

**لنگ** / leng ، ـها/:اسم. *[گفتاری]* لاق؛ پا؛ قاچ؛ چاق؛ پاق؛ باق؛ بۆق؛ لۆق؛ لێق؛ لنگ؛ لینگ؛ تەشک؛ لە بن ڕانەوە تا ئەنگوستی پێ.

▣ **لنگ کردن:** پاشقول دان؛ پاچەقولێ دان؛ پانجەقولێ دان؛ لاقی کەسێ گرتن و بە زەویدا دانی ‹کنار نشسته می‌گوید لنگش کن!: پالیداوەتەوە ئێژی پاشقولی دە!›.

**لنگ کسی/ چیزی در هوا بودن:** *[کنایی]* شتێ/ کەسێ لنگەو قلوور بوون؛ ژێر پێی کەسێ خالی بوون؛ سەرەو حەوا بوون؛ بە بار و دۆخی نادیار و ئالۆزەوە بوون ‹کار شرکت لنگش در هواست: کار و باری دابەشگە لنگە و قلوورە›.

**تا لنگ ظهر خوابیدن:** *[مجازی]* تا کولەی نیوەڕۆ نووستن؛ تا قرچە/ بانگی نیوەڕۆ خەوتن؛ هەتا نیوەڕۆ نووستن.

**لنگ** / long ، ـها/:اسم. فۆتە؛ شەملک؛ لۆنگ؛ لوونگ؛ بەربالاف؛ پارچەیەکی درێژۆکە بۆ داپۆشانی پشتێنە بەرەوخوار (بەتایبەت لە حەمامدا).

▣ **لنگ انداختن پیش کسی:** *[مجازی]* لە حاندی کەسێکدا سەر خەواندن.

**لنگ بستن:** فۆتە بەستن؛ شەملک لە بەر کردن/ پۆشین/ بەستن؛ لۆنگ پێچان؛ داپۆشانی پشتێنە بەرەوخوار بە شەملک.

**لنگان**[1] / langān/: *صفت.* شەل؛ چوور؛ لەنگ؛ کوللەک؛ کولەک ‹با پای لنگان پیش من آمد: بە لاقی شەلەوە هات بۆ لام›.

**لنگان**[2]: *قید.* شەلەشەل؛ بە شەلەشەل؛ شەلان؛ قرنگ؛ لەنگەلەنگ ‹لنگان می‌رفت: شەلەشەل دەڕۆشت›.

**لنگ‌دراز** / lengderāz ، ـها/: *صفت.* لاق درێژ؛ قاچ درێژ؛ قول درێژ؛ لۆق درێژ؛ لنگ درێژ؛ وراق؛ لۆقی؛ بەژن ڕاژە؛ لۆقن؛ لەگە؛ لۆقلۆقی؛ خاوەنی پای درێژ و زۆر بەرز ‹یک جوان لنگ‌دراز روی صحنه آمد: لاوێکی لاقدرێژ هاتە سەر شانۆ›.

**لنگر** / langar/: [از یونانی]/اسم. لەنگەر؛ لەنگر: ١. /ـها/ قولاپی گەورە و قورسی ئاسنی کە بە زەنجیرەوەکراوە و بۆ ڕاگرتنی گەمیە دەخرێتە دەریاوە ٢. /ـها/ چەرخی بچووکی نێو کاتژمێر ٣. قورسی ژێر باری لار و سەنگ.

▣ **لنگر انداختن:** ١. لەنگەر خستن/ هاویشتن/ ئاویشتن/ هاویتن؛ ڕاوەگرتنی گەمیە لە پەنا ئیشکانیدا ٢. *[کنایی]* بار و بنە خستن؛ بنە

خستن؛ بنە خوەش کردن؛ داخستن؛ لە جێگەیەک مانەوە و نیشتەجێ بوون ‹چند ماه در خانەی ما لنگر انداخته بود: چەن مانگ لە ماڵی ئێمەدا بار و بنەی خستبوو›.

**لنگر دادن**: شان خستن؛ پاڵ دان؛ کەفتنە شاندا؛ لەنگەر دان؛ سەنگ وسەی ‹بارها لنگر داد و ماشین را چپه کرد: بارەکە شانی خست و ماشینەکەی چەپ کرد›.

**لنگر کشیدن**: لەنگەرکێشان/ هەڵکێشان؛ کێشانەسەری لەنگەر بۆ ڕێ کەوتن ‹کشتی لنگر کشید و از ساحل دور شد: گەمیەکە لەنگەری کێشا و لە بەستێن دوور کەوتەوە›.

**لنگرگاه** / langargāh ، ـها/: [از یونانی/ فارسی] /اسم. تابگە؛ لەنگەرگا؛ لەنگەرگە؛ لەنگەرجێ؛ جێگەی لەنگەرگرتنی گەمی و بەلەم و کەلەک لە چۆم و زەریادا کە بەشی خۆی قووڵە.

**لنگ‌لنگان** / langlangān/: قید. شەلەشەل؛ بە شەلەشەل؛ کوولی‌کوولی؛ قرنگ‌قرنگ؛ لەنگەلەنگ؛ ڕۆیشتن بە پای سەقەت ‹لنگ لنگان خودش را به خانه رساند: شەلەشەل خۆی گەیاندە ماڵەوە›.

**لنگ و پاچه** / leng-o-pāče/: اسم. [تعریض] قاچ و قول؛ لەنگ و لەتەر؛ پووز و پا؛ پا و پل؛ قول و قاچ؛ پێ، بەتایبەت بەشی سەرەوەی ‹حواسش همیشه دنبال لنگ و پاچەی خانم‌هاست: بیری هەر ها بە دوای قاچ و قولی ژنانەوە›.

**لنگه**[1] / lenge ، ـها/: اسم. تا؛ لنگه لنگ: ۱. لف؛ لفه؛ کەرەستەی هاوماڵ یان هاولفی یەکێکی‌تر کە پێکەوە بە کار دێن ‹لنگەی کفش؛ لنگەی گوشواره؛ در دو لنگه: تای کەوش؛ لفەی گوارە؛ دەرگای دوو تایی› ۲. یەکەی ژماردنی تاکێک لە دووی جووت. بەرانبەر: **جفت** ‹سه لنگه کفش؛ یک لنگه بار: سێ تا کەوش؛ لنگێ بار› ۳. جەم؛ یەکەی شتومەکی نێو تەلیس ‹چهار لنگه پیاز؛ دو لنگه برنج: چوار تا پیواز؛ دوو لنگە برینج›.

**لنگه**[2]: صفت. [گفتاری] لف؛ وێنە؛ لنگە؛ هاولف؛ هاوتا؛ هاولفە؛ هاوماڵ؛ هاوکێش؛ هاوشان؛ هاوچەشن ‹او هم لنگەی برادرش است؛ لنگه ندارد: ئەویش لفی ئابرایە؛ هاوتای نیە›.

**لنگه‌به‌لنگه** / lengebelenge/: صفت. تاوەتا: ۱. لفبەلف؛ لنگاولنگ؛ لنگ‌وەلنگ؛ پێوەندیدار یان سەر بە جووتی جۆراجۆر ‹جورابت لنگه به لنگه است: گۆرەویەکەت تاوەتایە› ۲. خوار و خێچ؛ لار و گێڕ؛ لاوەلا؛ نابەرامبەر و خوار ‹با چشم‌های لنگه به لنگه معلوم نبود کجا را نگاه می‌کند!: بە چاوی خوار و خێچەوە دیار نەبوو چاو لە کوێ دەکا!›.

**لنگه‌جوراب** / lengecûrāb ، ـها/: اسم. تاگۆرەوی؛ تاگۆروا؛ لنگە گۆرەوێ؛ لنگە گۆرەوە؛ هەر کام لە تاکانی جووتێ گۆرەوێ.

**لنگه‌کفش** / lengekafš ، ـها/: اسم. تاکەوش؛ لنگەپالا؛ لفەپێلا؛ لفەشەکاڵ؛ هەر تایێ لە جووتێ کەوش.

**لنگی** / langî/: اسم. لەنگی: ۱. شەلی؛ شەلیەتی؛ شەلیایی؛ پاسەقەتی؛ کوللەکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی شەل بوون ‹با وجود لنگی خوب می‌دوید: بەو شەلیەوە باش دەرئەچوو› ۲. گیر و گرفت؛ تەق و لەقی؛ کێشەی وا کە کار بخەوێنێ ‹لنگی در کارمان پیش آمد: کارەکەمان گیر و گرفتی تێکەوت›.

**لنگیدن** / langîdan/: مصدر. لازم. // **لنگیدی**: شەلیت؛ **می‌لنگی**: دەشەلی؛ **بلنگ**: بشەلە // لەنگین؛ لەنگان: ۱. شەلین؛ لنگرین؛ شەلەی؛ شەلای؛ خنگلین؛ لەنگای؛ نەجمین؛ بە هۆی ئێش یان کەمایەسی پاوە بە ئاستەم ڕێ کردن ‹موقع راه رفتن می‌لنگید: لە ڕۆیشتندا دەشەلی› ۲. گیر و گرفت هەبوون لە کاردا ‹یک جای کارش می‌لنگید: کارەکەی لە لایەکەوە دەلەنگی›.

■ صفت مفعولی: **لنگیده** (شەلیو)/ مصدر منفی: **نَلنگیدن** (نەشەلین)

**لنینیسم** / lenînîsm/: [فرانسوی] /اسم. لینینیسم؛

بنـــەما و بەرنامـــەی ڕامیـــاری، ئـــابووری و کۆمەڵایەتی دانـراو لـە لایـەن ولادیمـیر ایلـیچ لیـــنین شۆڕشـــگێڕ و پێشـــەوای ڕووســـەوە (۱۸۷۰ـ۱۹۲٤ ز.).

**لو** / :low, lo:/اسم. داو؛ تەڵە؛ دامی؛ تـەڵ و داو (راڤە: بە تەنیایی بە کار ناچێ).

▣ **لـو دادن**: دانـە تەڵـەوە؛ دانـە داوەوە: ۱. بـە دەستەوە دان؛ تاوانبار ناساندن ‹یکی از دزدها بقیه را لو داد: یـەک لـە دزەکـان باقیـانی دایـە تەڵەوە› ۲. دەرخستن؛ خستنە بـەر مەترسی ‹پول‌هایش را لو داد و از جیبش دزدیدنـد: پارەکـانی دەرخست و لە گیرفانیان ڕفاند›.

**لـو رفـتن**: ناسـرانەوە؛ دۆڕیـان؛ دەرکـەوتن؛ کەفتنە دەرەوە؛ ئاشکرا بـوونی نهـێنی وا کـە کەســانێک بـــە شـــوێنیەوەن ‹بعـد از دو مـاه چاپخانەی مخفی لو رفت: پاش دوو مانگ چاپخانـە دزەکیەکە ناسرایەوە›.

**لوا** / :lavā/ [عربی]/اسم. [قدیمی] ئاڵا؛ ئالا؛ بەیداخ؛ بەیاخ؛ بەندێر.

**لوار** / lavār ، ـها/: [از کردی]/اسم. لێـوار؛ لێـوارە؛ هێڵی قەراخی چۆم کـە بـە هـۆی داشـۆردن و تەپینی بەستێن لە هەر دوو لاوە بەدی دێ یان بۆ بەرگری لە لافاو دروستی دەکەن.

**لـوازم** / :lavāzem/ [عربـی]/اسم. ۱. جمـعِ ☜ **لازمه** ۲. پێداویسـتی؛ کـەل‌وپـەل؛ کێـل‌وپێـل؛ چت‌ومت؛ شت‌ومەک؛ چت‌ومەک؛ کـەل‌ومـەل؛ کۆمەڵی کەل‌وپەل و کەرەسـتەی پێویسـت بـۆ کار یـان جێگایـەکی تایبـەت ‹لـوازم بچـه: لـوازم تحریر: پێداویستی زارۆک؛ پێداویستی نووسین›.

▣ **لوازم تحریـر**: قەڵـەم و کاغـەز؛ کەرەسـتە و ئامێری نووسین.

**لوازم منزل**: کەل‌وپەل؛ پرتاڵ؛ هێرک؛ نێوماڵ؛ ناومـاڵ؛ ناوماڵـە؛ کـەل‌وپـووری نـاو مـاڵ؛ پێداویستی ماڵ.

**لـواش** / lavāš ، ـهـا/:اسم. شکەفـا؛ لـەواش؛ لەواشە؛ ناناتیرە؛ نانی تیری؛ نانـێ تیریـە؛ نـانی ناسـک و پـان و تـەنک کـە بـە تـیرۆک پـان دەکرێتەوە و بە تەندووردا دەدرێ.

**لواشـک** / lavāšak ، ـهـا/:اسم. نـان‌قەیسـی؛ نانەقەیسی؛ زەردالی؛ شاتەلی؛ لەواشەک؛ خەروا؛ قەمەردین؛ قەمرەددین؛ قەیسی؛ جۆرێک چێـژە و چەرە لە گۆشتی میوەی مزر و ئـاودار کـە لـە پێشدا دەیکوڵێنن تا خەست بێتەوە ئانجـا وەک پەڕەیەکی ناسک، پان و وشکی دەکەنەوە.

**لواشی** / lavāšî ، ـها/:اسم. لەواشی؛ نـان تـیری؛ شکەڤـایی؛ ئـەوەی نـانی تـیری دەکـا یـان دەیفرۆشێ.

**لواط** / :levāt/ [عربی]/اسم. قوونەگان؛ قنگـەگان؛ نێربازی؛ تێکەڵاوی جینسی دوو مرۆی نێر.

**لواف** / :lavvāf/ [عربی] ☜ **لبّاف**

**لوافی** / :lavvāfî/ [عربی] ☜ **لبّافی**

**لوایح** / :lavāyeh/ [عربی] جمعِ ☜ **لایحه**

**لوئی** / /lû'î/ ☜ **لویی**

**لوب** / /lob/ ☜ **لَپ**

**لوبیا** / lûbiyā ، ـها/: [سریانی از یونانی]/اسم. لۆبیـا؛ لووبیـا؛ لـووبی؛ لووبیـە؛ لۆپـک؛ لۆڤـک؛ لـۆوک؛ فاسولیا؛ فاسۆلیا: ۱. گیایەکی ئالیکی هەڵچوو بە گەڵای بلاو، گوڵی سپی ئاماڵ زەرد یان بنەوش و بـــەری خـــڕ و خۆراکیـــەوە ۲. ماشەســـوورە؛ ماشەسۆرە؛ ماشەسپی؛ هـولیرەبـاخی؛ قەلووکـە؛ دەنکی درێژووکەی ئەو گیایە کە چەنـد جـۆری هەیە و هەمووی دەخورێ.

▣ **لوبیا چشم‌بلبلـی**: ماشـک؛ زازۆک؛ چەشـنێک لووبیای خڕ و گچکە بە ڕەنگـی شـیری و دوو خاڵی ڕەشەوە وەک چاو.

**لوبیا چیتی**: لووبیا شڵـە؛ لووبیـا بـازی؛ لووبیـا چیتی؛ چەشنێک لوبیـای درشـت و پەمـەیی یان بنەوش بە پەڵەی سپیەوە.

**لوبیا سبز**: لووبیـا سـەوز؛ چەشـنێک لووبیـای وەک کالانێکی سەوز کە دەنکی سپی تێدایە.

**لوبیا سفید:** ماشەسپی؛ لووبیا چەرمە؛ ماشە سپیلکە؛ چەشنێک لووبیای بە دەنکی سپی تەختەوە.

**لوبیاقرمز:** لووبیا سوورە؛ چەشنێک لوبیای دەنک سوور و گەورەتر لە ماشە سپیلکە.

**لوبیـاپلو** / lûbiyāpolow, -polo: /: [سریانی/فارسی]/اسم. لووبیاپلاو؛ چەشنێک پلاو لە گۆشتی قیمە، لووبیای سەوز و ئاوی تەماتە.

**لوت** / lût /: اسم. [قدیمی] لۆت؛ چێشت؛ خۆراک.

**لوتیم** / lûtetiyom /: [فرانسوی]/اسم. لووتیتیوم؛ توخمی کیمیایی کانزایی لە ئاخری ڕیزی لانتانیدەکان، بە ژمارەی ئەتومی ٧١ و کێشی ئەتومی١٧٤,٩٧: **لوتسیم**

**لوترا** / lûtarā /: اسم. لۆترە؛ زمانی داندراوی نێوان دوو یان چەند کەس کە بۆ تێنەگەیشتنی کەسانی دیکە دەگوترێ.

**لوترن** / lûteran /: [انگلیسی] صفت. لووتران: ١. سەر بە ئایینی مارتین لوتر (١٤٨٣ــ ١٥٤٦ز.) دامەزرێنی ڕێبازی پرۆتستان ٢. /ـها/ شوێنکەوتووانی ئەو ڕێبازە.

**لوترەگو(ی)** / lûtaregû(y) / ، ـان/: اسم. لۆترەوێژ؛ بە لۆترە داخێو؛ یەک لە چەند کەسێ کە بە زمانی نێوان خۆیان دەتوانێ قسە بکا.

**لوتسیم** / lûtesiyom /: [فرانسوی] ☜ **لوتِتیُم**

**لوتو** / loto /: [فرانسوی]/اسم. دەبلـنا؛ دەوڵـنا؛ جۆرێ کایەی چەند کەسی بە ٩٠ ژمارە لە کیسەیەکدا و چەند پەڕی هەر کام ١٥ ژمارە لە سەر نووسراو. هەر کەسە پەڕێک لە پێش خۆی دادەنێ و یەکێک لە کیسەکە ژمارە ــ بە هەڵکەوت ـ دەردێنێ و دەیخوێنێتەوە. کەسێ کە پێشتر لە باقی هەموو ژمارەی سەر پەڕەکەی بخوێنرێتەوە، بەرەندەیە: **بینگو، دَبِلنا**

**لوتی**[1] / lûtî ، ـها؛ ـان/: اسم. لۆتی؛ شایەر؛ چەمباز؛ بەزمگێڕ: **لوطی**

**لوتی**[2]: صفت. جوامێر؛ دلاوا؛ مێرخاس؛ شەجۆ؛ خاوەن ئاکار و خووی پاڵەوانی و پاراستنی بایەخگەلی کۆمەڵگا: **لوطی**

**لوتی‌خور** / lûtîxor /: صفت. لۆتی‌خۆر؛ لە کیس‌دراو و خوراوی دەست زۆردار: **لوطی‌خور**

**لوتیگری** / lûtîgarî ، ـها/: اسم. جوامێری؛ مرۆچاکی؛ مێرخاسی: **لوطیگری**

**لوث** / lows, lo:s /: [عربی]/اسم. پیسی؛ چەپەڵی؛ پیساتی؛ گەماری؛ ناخاوێنی؛ پەلەشتی؛ پۆخڵی.

⊡ **لوث شدن:** [کنایی] ئاڵۆزان؛ ئاڵۆز بوون؛ تێکەڵ بوون بە شتی‌تر و دۆخی خۆ لە دەست دان ‹آن‌قدر حرف‌های بی‌سر و ته زدند که مطلب لوث شد: هێندەیان قسەی هەرچی‌وپەرچی کرد باسەکە ئاڵوزا›. هەروەها: **لوث کردن**

**لوچ** / lûč /: صفت. خێل؛ خوێل؛ خویل؛ کیل؛ تیل؛ لووچ؛ فیچ؛ خیچ؛ قلیچ؛ قلۆچ؛ ویر؛ وێر؛ کاژ؛ هەڵجەر؛ عول؛ چەپخێل؛ ڤێر؛ گیل؛ چاولار؛ چاوگێڕ؛ چاوچێڵ؛ چاوخێل؛ چاو چەپوچێڵ؛ چاوشاش؛ چاو لە حەوا؛ چاوخوار: **قیج**

**لوچه** / lowče, lo:če /: اسم. لوچ؛ لچ؛ لەوچ؛ لیچ؛ لەوس؛ بەشی ژێرینی لێوی خواروو.

**لوچی** / lûčî /: اسم. خێلی؛ خوێلی؛ خێچی؛ چەپخێلی؛ چەپخولی؛ چاولاری.

**لوح** / lowh, lo:h ، ـها؛ الواح/: [عربی]/اسم. وەر؛ تەتەڵە؛ لەوح؛ دەب؛ دەپ؛ تەختە؛ لەوحە؛ پارچەتەختە، پارچە بەرد یان شتی ڕەق و تەختی بۆ لە سەر نووسین.

⊡ **لوح تقدیر:** لەتە مقەبا یان کاغەزێ کە بە سەریەوە دەقێک بۆ ئەمەگ‌ناسی و ڕێزگرتن لە کەسێک بە بۆنەی کارێکەوە نووسراوە.

**لوح فشرده** ☜ **سی‌دی**

**لوحه** / lowhe, lo:he ، ـها؛ الواح/: [عربی/فارسی]/اسم. وەر؛ لەوحە: ١. پەڕەیەکی کانزایی یان چێوی کە شتێکی پێوە نووسرابێ ٢. تەختە؛ تەتەڵە.

⊡ **لوحەی یادبود:** لەوحێ کە بۆ بیرەوەری

ڕووداوێک، کات و بۆنەی لە سەر نووسراوە.

**لــودر** / loder، ـهـا/: [انگلیسـی]/اسم. لـۆدر؛ ماشینێک بە دەمە یان بێلێکی زل و قووڵەوە بۆ هەڵگرتنی شت (بەفر یان خاک) و هەڵڕژاندنی لە شوێنێکی تر.

**لودگی** / lowdegî, lo:degî، ـها/:/اسم. تیتاڵـی؛ جەفەنگبازی؛ هەنەکبازی؛ لاقردی ‹لـودگی نکـن! جدی می‌گویی؟: تیتالی مەکە! بە ڕاستیتە؟›.

**لـوده**[1] / lowde, lo:de، ـهـا/:/اسم. سـەوەتە؛ دەفری زل و قـووچی لـە تـووڵ چنـراو بـۆ بـار کێشان.

**لـوده**[2] / ـهـا/: صفت. حەنـەکچی؛ هـەنکچی؛ حەنەکبێژ؛ قسەسـەیر؛ قسـەخۆش؛ قسـەوەش؛ تیتاڵباز؛ گاڵتەچی؛ لێپۆک؛ گاڵتەباز؛ گەمەکەر؛ گاڵـتەبێژ؛ نوکتـەباز؛ لیـزۆک؛ لێبـۆکی؛ لـەودە؛ قـەرفۆک؛ فەنـەک؛ هـۆگری گـەپ و گاڵـتە و قسەی سەیرـ سەیر ‹از آن آدم‌های لوده و بـی‌خیـال است: مرۆیەکی حەنەکچی و بێخەم بژییە›.

**لور** / lûr/: [از کردی]/اسم. لۆر؛ لۆرک؛ خواردنێکـە لە شیری برسکاوی ئاو لێ‌چنراو.

**لوردراپــه** / loverd(e)rāpe/: [فرانسـوی] ☜ **لووردراپە**

**لورده** / lavarde/ ☜ **لەولوردە**

**لوزالمعـده** / lowzolme'de, lo:zol-/: [عربـی] /اسم. شپیلک؛ لەوزولمیعدە؛ پانکراس؛ ئەندامێکی بادامی لە ژێر و پشتی گەدەدا کە سەرەکەی بـە دوانزەگرێ و بنەکەی بە سپلەوە بەندە.

**لوزتین** / lowzateyn, lo:zateyn/: [عربـی]/اسـم. ئالـۆ؛ ئـاروو؛ ئالـک؛ هالـوو؛ لای‌لای؛ گۆشـەک؛ گوشەک؛ کلمل؛ دوو بادامـەی ئـەملا و ئـەولای گـەردن ‹لـوزتین شـما کمـی متـورم اسـت: ئالـۆتان هێندێک هاتووە›.

**لوزه** / lowze, lo:ze، ـها/: [عربی]/اسم. ئالۆ؛ ئالۆ؛ گەلالە؛ گلالە؛ گەلالوچک؛ گەلالووچک؛ لکمـل؛ بادامە؛ لەوزە؛ تینگ؛ مەرازە؛ مەلاژە؛ هەر کام لە دوو لووی ئـەملا و ئـەولای قـوڕگ کـە لـە نـاو دەمەوە دیارە.

**لوزی** / lowzî, lo:zî، ـها/: [عربی]/اسم. لـەوزی؛ جۆرێـک چوارگـۆش بـە لاسـکی هاوبـەژن و گۆشەی دوو بە دوو بەرامبەرەوە.

**لوژ** / lûj، ـها/: [فرانسوی]/اسم. کاشەک؛ تاخورکە؛ خزاکلە؛ کاشەی چکۆلە کە تێیدەچن و بە سـەر بـەفر و یەخـدا بـەری دەدەنـەوە. هـەروەها: **لوژسواری**

**لوس** / lûs/: صفت. لووس؛ تەسـک: ١. لاتـەری؛ گۆترە؛ هەروایی؛ بێ‌تام؛ لە قەستی و بەبێ سوور بوون و زیری ‹فیلم لوس؛ رفتار لوس: فیلمی بێ‌تـام؛ کردەوەی هەروایی› ٢. ـها/ نیخ؛ بە تایبەتمەندی خۆ منداڵ‌کردنەوە و نازکردن.

▣ **لوس شدن**: نیخ بوون؛ تەسک بیەی؛ نازکردن و خۆ منداڵ‌کردنەوە.

**لوس کردن**: نیخ‌کردن؛ بە دەمەوەدان و فێری ناز و نووزکردن.

**خود را لوس کـردن**: خـۆ نـیخ‌کردنـەوە؛ وێ تەسک‌کەردەیوە؛ ئاکاری منداڵانە و سووک لە خۆ نیشاندان.

**لوس‌بازی** / lûsbāzî، ـها/:/اسم. کاری خۆ منداڵ کردنەوە.

**لوسـتر** / lûst(e)r, lûsr، ـهـا/: [فرانسـوی]/اسـم. چلچرا؛ قەندیل؛ لووستر؛ چرای بە چەن گڵۆپەی لە میچەوە هەڵواسراو.

**لوسمی** / lusemî/: [فرانسوی]/اسم. شـێرپەنجەی خـوێن؛ نەخۆشـی زۆر بوونـەوە و تێکچـوونی بیچمی گلوبوولی سپی.

**لوسـیون** / lusyon, los(i)yon، ـهـا/: [فرانسـوی] /اسم. لووسیۆن؛ تراوێکی یەک یـان چەنـد مـاک تێدا تێکەڵاو بە شێوەیەک کە بنەنیش نەبێ.

**لوطی** / lûtî/: [معرب] ☜ **لوتی**

**لوطی‌خور**/lûtîxor/:[معرب/فارسی] ☜ **لوتی‌خور**

**لــوطیگری** / lûtîgarî/: [معـرب/ فارسـی] ☜

**لوتیگری**

**لوک**[1] / lûk/ ☜ شتر لوک، **شتر**

**لوک**[2] / lûk/ *صفت.[قدیمی]* ١. گۆج؛ کوچ؛ کووچ؛ کۆل؛ تووشیاری نوقسانی دەست یان پێ بەتایبەت دەست ٢. ئەستوور؛ ستوور؛ ستۆکوور؛ قایم؛ قەیم.

**لوکس**[1] / lûks/: [فرانسوی]/*اسم.* لووکس؛ یەکەی رووناکی بەرامبەر بە یەک لوومەن بە سەر میترێکی چوارگۆشدا.

**لوکس**[2]: *صفت.* شیک؛ بەشکۆ؛ لەبار؛ لووکس ‹ماشین لوکس؛ خانەی لوکس: ماشێنی شیک؛ مالی بەشکۆ›.

**لوکوسیت** / lokosît، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* *[زیستشناسی]* گلوبوولی سپی.

**لوکوموتیو** / lokomotîv/: [فرانسوی] ☜ **لکوموتیو**

**لول**[1] / lûl، ـها/:/*اسم.* لوول؛ لوولە ‹لول تریاک؛ تفنگ دولول: لوولی تلیاک؛ تفەنگی دوولوول›.

**لول**[2]: *صفت.* تەلەس؛ رەشەمەست؛ مەلەنگ؛ تەواو مەست ‹وقتی دیدمش لول بود، تلوتلو می‌خورد: کە دیتم تەلەس بوو، دارەی دەهات›.

**لولا** / lowlā, lo:lā، ـها/:/*اسم.* ئەنجامە؛ لەولاوە؛ لەولا؛ لاولاوە؛ چەفتەلی: ١. کەرەستەیەکی جمگەدار یان چەماندنی کە دەرک، پەنجەرە یان دەلاقەی لە سەر دەسوورێ، دەکرێتەوە و دەبەسترێ ٢. میلە یان چوکلێ کە کەرەستەیەکی بەدەوردا دەسوورێتەوە.

**لولاگر** / lowlāgar, lo:lā-، ـها؛ ـان/:/*اسم.* ئەنجامەساز؛ لەولاوەگەر؛ چێکەری لەولاوە.

**لولئین** / lûle'în/ ☜ **لولَهنگ**

**لولو** / lûlû/:/*اسم.* خۆخۆلێ؛ شەولەبان؛ لوولکە؛ ئولوولوو؛ بەئۆک؛ ئووڤ؛ مەوت؛ قازانەسەر؛ ئایشە گوێدرێژ؛ کاوەر: ١. منالترسێن؛ ناوی شتێکی نەبووی خەیالیە وەک درنج منالی پێ دەترسێنن ٢. بوونەوەری زۆر ترسناک ✻

**لولوخورخوره**

▣ **لولوی سرخرمن:** ١. داول؛ داوەل؛ دالۆ؛ داهۆل؛ دالەهۆ؛ داوەلە؛ داوول؛ هەراسە؛ ترچماق؛ بەرتەلاش؛ مەترەس ٢. گۆپۆ؛ حەپەنتی؛ زرتەزەلام؛ مەندەبۆر؛ مەندەبوور؛ زەلامی زل و بەتال و هیچ لێنەهاتوو ‹این لولوی سرخرمن از کجا پیدایش شد؟: ئەو گۆپۆیە لە کوێوە هات›.

**لولوخورخوره** / lûlûxorxore/ ☜ **لولو**

**لوله** / lûle، ـها/:/*اسم.* لیله؛ لوولە؛ لیلی؛ لوولێ؛ زرندی؛ لولا؛ بۆری؛ بۆریە؛ لوولک؛ لەیلووک؛ لەلووک؛ کێسین: ١. کەرەستەیەکی درێژی ناو بەتال، بۆ گۆزاندنەوەی تراو، گاز و... ٢. بەشێ لە ئامرازێ کە بیچمی وایە ‹لولەی آفتابە: لوولەی ئەفتاوە› ٣. ئەندامێ کە وەکوو لوولەیە ‹لولەی نای: لوولەی قورقوراچکە›.

▣ **لولەی آزمایش:** لوولەی ئەزموون/ هێچ/ تاقیکاری؛ لوولەی باریک و لووس لە شیشەی ناسک و پتەو کە سەرێکی گیراوە و لە تاقیگەی کیمیا و ژیناسیدا کەلکی لێوەردەگرن.

**لولەی اُستاش:** *[کالبدشناسی]* لوولەی ئوستاش؛ دەراوێک بە درێژایی ٣٥ـ ٤٥ میلی‌میتر کە گوێی نیوانی دەخاتە سەر کلۆرەکانی لووت و دەبێتە هۆی هاوسەنگی هەوا لە هەر دوولای پەردەی گوێدا.

**لولەی اگزوز:** لوولەی ئیگزۆز؛ لوولەی بردنەدەری دووکەلی موتۆر.

**لولەی چراغ:** شووشە/ شیشە لامپا؛ شووشەچرا؛ شیشەچرا؛ شیشەی گرۆڤەری سەر چرالامپا: **لولەی لامپا**

**لولەی خرطومی** ☜ **لولەخرطومی**

**لولەی گوارش:** *[کالبدشناسی]* لولەی هەرسەک؛ بۆریەی هەلتاوینی خۆراک کە لە دەمەوە دەست پێدەکا و لە ئەوک، سوورێنە، گەدە،

ڕیخۆڵەی بچووک و ڕیخۆڵـەی گـەورە پێـک دێ و لە کۆمدا دوایی دێ.

**لوله‌ی لامپا** ☜ **لوله‌ی چراغ**

◘ **لوله شدن**: لووله بـوون؛ لیلـه بـوون؛ زڕنـدی بوون؛ بوونە لوولە؛ لوول بوون؛ بەبیچمی لوولە دەرهاتن. هەروەها: **لوله کردن**

**لوله کشیدن** ☜ **لوله‌کشی**

**لوله‌ای** / lûle'î/: صفت. لوولەیی؛ لیلـەیی؛ وەک لوولە ‹لامپ لوله‌ای: گلۆپی لوولەیی›.

**لوله‌باز کن** / lûlebāzkon ، ـها/: اسم. لوولەبەردەر؛ لوولەبازکـەر: ۱. ئـامێر یـا مـاکی شـیمیایی بـۆ بەردانی لوولەی گـیراو ۲. کەسـێ کـە لوولـەی گیراو بەردەدا.

**لوله‌بر** / lûlebor ، ـهـا/: اسم. لوولەبـڕ؛ لوولـەوڕ؛ لیلەبڕ؛ ئامێری پێ بڕینی لوولە.

**لوله‌خرطـومی** / lûlexortûmî ، ـهـا/: [فارسـی/ عربی] اسم. گەردەبل؛ جۆرێک لوولـەی نـەرم بـە شێوەی ئاڵقەی پێکەوە بەسراو کە دێنە یـەک و دەکرێنەوە.

**لولـەخـم کـن** / lûlexamkon ، ـهـا/: اسم. لوول چـەمێن؛ ئـامێری چەماندنـەوەی لوولـەی کانزایی.

**لوله‌سازی** / lûlesāzî /: اسم. لوولـە سـازی: ۱. کـاری چێکـرنی لوولـە ۲. /ـهـا/ کارخانـە یـان کارگەی دروست‌کردنی لوولە. هەروەها: **لوله‌ساز**

**لولـه‌کـش** / lûlekeš ، ـهـا/: اسم. لوولـەکێش؛ لیلەکێش؛ کەسێ کە کاری دانان و دامـەزران و بەرێ‌خستنی لوولە، شێر، شێرفەلەکە، هەماراو و شتی وایە.

**لولـه‌کشـی** / lûlekešî/: اسـم. لوولەکێشـی؛ لیلەکێشی: ۱. کاری دانان و دامەزراندنی لوولـە ‹بسیاری از دهات هنوز لوله‌کشی نشده‌اند: زۆرێـک لـە دێهاتەکان هێشتا لوولەکێشی نەکراون› هـەروەها: **لوله‌کشی کردن** ۲. /ـهـا/ کارگـەی لوولەکێشـی ۳. پیشەی لوولەکێش ٤. /ـها/ تۆڕێک لە لوولە، شێر و فەلەکە بۆ ڕاگوێزانی گاز و تراو.

**لوله‌گذاری** / lûlegozārî ، ـها/: اسم. ۱. کـار و ڕەوتی دانـان و دامەزرانـدنی لوولـە و... بـۆ گواسـتنەوەی گـاز و تـراو لـە کۆگایەکـەوە بـۆ شوێنی ڕەچاوکراو ۲. [پزشکی] تێڕۆکردنی لوولـە بۆ ناولەشـی گیانـدار بـۆ دەرمـان یـان نموونـە هەڵگرتن. هەروەها: **لوله‌گذاری کردن**

**لولهنگ** / lûleheng, lûlehang ، ـها/: اسم. لولێ؛ لوولێنە؛ لوولەینە؛ ئافتـاوەی سوالـەت: **لـولئین؛ لولهین**

◘ **لولهنگ کسـی زیـاد آب برداشـتن**: [تعـریض] ئاخوڕی کەسێ بەرز بوون؛ لە ئاشـی سـەررێ کردن؛ لەگەڵ ماڵـی یاقوبـەگا بـزن برینـەوە؛ دەس‌ڕۆیشتوو بوون ‹حـالا دیگـر بـا کلـه‌گنـده‌ها نشسـت و برخاسـت مـی‌کنـد و لـولهنگش زیـاد آب برمی‌دارد: ئێستا ئیدی لەگەڵ سەرزلەکان ئاموشـۆ دەکا و ئاخوڕی بەرزە›.

**لولهین** / lûlehîn/ ☜ **لولهنگ**

**لـولی** / lûlî ، ـان/: اسـم. [ادبی] کۆڵـی؛ کـوولی؛ کاولی؛ کەولی؛ کاولی؛ قەرەچی؛ قەرەج؛ قەرەچ؛ قەرێچ؛ ژن یان کچـی لـە خێڵـی چادرنشـین و گەڕۆکی بڵاو بە هەموو جەهاندا.

**لولیدن** / lûlîdan/: مصدر. لازم. // **لولیدی**: لوولای؛ **مـی‌لـولی**: دەلـوولی؛ **بلـول**: بلوولـە// لـوولان: ۱. لەخشـان؛ لەخشـین؛ خشـکەکردن؛ زیـوان؛ وەک کـرم جووڵـەکردن ۲. تـل‌خواردنـەوە؛ ژلێوەئامەی؛ هۆرژلێویایوە؛ بە شـێوەی کۆمایـێ لە ناو یەکدا یان لە ناو قوڕ و پیسیدا ژلیویان.

■ صفت مفعولی: **لولیده** (لوولیـاگ)/ مصـدر منفی: **نلولیدن** (نەلوولیان)

**لومباگو** / lûmbāgo/: [؟] اسم. [پزشکی] لوومباگۆ؛ پشت ئێشەی زۆر و تاوسێن.

**لومپن** / lompan ، ـها/: [انگلیسی] صفت. لومپەن: ۱. خاوەنی کاری حـەرام و نـاڕەوا وەک قومـار، خۆفرۆشی، شۆفاری و باجگری ۲. [مجازی] لات؛

ئەڵوات؛ شەللات؛ گەلاج.

**لومن** / lûman/: [فرانسوی]/اسم. لوومەن؛ یەکەی تاوی ڕووناکی، بەرامبەر بە ڕووناهی شەمێک بە سەر ڕووبەرێکی ساف و سپیدا.

**لـون** / lown, lo:n ، ـها؛ الـوان/: [عربـی]/اسم. *[نامتداول]* ڕەنگ؛ چر.

**لونـد** / lavand ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* لەوەنـد؛ لەڤەند؛ بە لەنجە و لار؛ نازفرۆش؛ نازکـەر؛ بـەناز ‹یک دختـر لونـد مرتـب بـه پسرها چشمک مـی‌زد و مـی‌خندیـد: کیژێکـی لەڤـەند لـە پەسـتا چـاوی لـە کوڕەکان دەقرتاند و بە دەمیانەوە پێدەکەنی›.

**لُونـــدی** / lavandî ، ـهـا/:اسم. لەڤـــەندی؛ لەوەنـدی؛ لەنجـە و لار؛ نازفرۆشـی؛ کەشـم و نەشـم؛ کردەوەیـێ کـە دەبێتـە هـۆی سـەرنج ڕاکێشی و هەستانەوەی حەزی جینسی پیاوان.

**لووردراپه** / loverd(e)rāpe ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. پەرداوێز؛ پەردەیەک بە شێوەی ڕزنێـک باریکـە پارچە یان پلاستیکی هەڵواسراو: **لوردراپه**

**لوولز** / levuloz/: [فرانسوی] ☜ **فُروکتوز**

**لویشه** / lavîše/:اسم. *[قـدیمی]* لۆشـکە؛ لۆچکـە؛ لەواشە؛ دوورک؛ قەفانچەلەی ناڵبەند کـە لێـوی یەکسمی پێ دەبەستن: **لباشن**

**لـــویی** / lûyî/:اسـم. کـەڕەپوو؛ گیامەشـرەق: ١. ڕووەکێک بە گەڵای باریـک و درێـژ، گوڵـی گوشراو و بەری خەڵەڵەی خورمایییەوە کە پـاش وشک بوون هەڵدەوەرێ و دەنکەکانی بـا دەیبـا ٢. ـها/ ناوی گشتی ئەم چەشنە ڕووەکانە* **لوئی**

**له** / lahe/: [عربی] حرف. بە قازانجی؛ بە قازانجوو؛ بە فەدی ‹دادگاه له او و علیه مدعی رای داد: دادگا بە قازانجی ئەو و دژی داواکار بڕیاری دا›.

**له** / leh/: صفت. مـڵ؛ پلـت؛ بـڵ؛ تولـخ؛ تـورخ؛ پووخ؛ پەلخ؛ پلخ؛ فلچ؛ پلـیخ؛ پلـیخاو؛ تلیخـاو؛ تلیق؛ پلیش؛ پلیشـاو؛ پلیشـاوە؛ پلـچ: ١. ورد و خاش و پانەوە بوو ٢. پان و لە بیچم کەوتوو لـە بەر کەوتنە ژێر تەوژم یان شتێکی قورسەوە.

◘ لــە شــدن: پــەلخان؛ پــەلخین؛ پلــیخان؛ پلــیخانەوە؛ پلیخانـەوە؛ داپلـۆخان؛ پلیشـان؛ پلیشانەوە؛ ولاین؛ تمان؛ شـلێقان؛ شلـێقیان؛ تلێقیان؛ تلـەقیان؛ تلیقـان؛ فلیقـان؛ فلێقـان؛ دافلیقـــان؛ فلیقانـــەوە؛ ژلیقـــان؛ هەڕشـــان؛ ڤرچقین؛ بەژڤین؛ هەڵـژیویان؛ پـان بوونـەوە؛ پانەوە بوون؛ فلچ بوونەوە؛ پلتەوە بیەی؛ پلـت بیەیوە؛ لە ژێر گوشاردا بیچم و شێوازی خۆ لە دەس دان. هەروەها: **له کردن**

**لهاندن** / lehāndan/: *مصدر. متعـدی. [نامتـداول]* // **لهاندی**: پلیخاندت؛ **مـی لهـانی**: دەپلـیخێنی؛ ـــ// پلــیخاندن؛ تلیقانــدن؛ تلەقانــدن؛ تلێقاننــەوە؛ تلیقانن؛ پەلچقاندن؛ پلـیخاندنەوە؛ پلـخاندنەوە؛ پەلخاندنــــەوە؛ پوورخاندنــــەوە؛ پلێشــــانەوە؛ پێشـــاندنەوە؛ پەتشـــاندن؛ پلچانـــدن؛ پلچـــانن؛ پـــەلاختن؛ پلیقاندنـــــەوە؛ پلتەوەکـــــەردەی؛ پلتکەردەیوە؛ شلێقانن؛ شلـێقنەی؛ شـلێقنای؛ تلێقنــــەی؛ تلێقنــــای؛ فلێقانــــدن؛ فلیقانــــدن؛ فلیقاننەوە؛ مەلقاندن؛ وچانن؛ تووچانن؛ ژلیقانن؛ هەڕشاندن؛ هەڕشتن؛ ڤرچقاندن.

■ صفت مفعولی: **لهانده** (پلیخاو)

**لهیده**/ lahîde, lehîde/: صفت. تلێقیاو؛ تلێقیاگ؛ ژلیقیـاو؛ فلیقـاو؛ پلیخـاو؛ پلیشـاو؛ داپلـۆخاو؛ دافرەقاو؛ دافەتاو.

**لهجه** / lahce ، ـها/: [عربی]/اسم. زار؛ زاراوە؛ زاراو: ١. چۆنیەتی وتـنی وشـەی زمانێـک بـە شـێوە زاراوە یان زمانێکی‌تر ‹کردی را بـا لهجـه‌ی فارسـی حرف می‌زد: کوردی بە زاراوەی فارسی قسە دەکـرد› ٢. شێوەی سەرزار، نەرمی قسە و تایبەتمەنـدی پەیڤی ناوچەیەکی دیاریکراو ‹لهجه‌ی کرمانشاهی: زاراوەی کرماشانی› ٣. دەراو؛ شێوەی قسەکردنی تاقمێکی کاری یان کۆمەڵایـەتی ‹لهجـه‌اش مثل بی‌سوادها بود: زاراوی وەک نەخوێندەواران وا بوو›.

**لهـذا** / lehāzā, lahāzā/: [عربـی] قیـد. کـەوابوو؛ کەوایە؛ بەم پێیە؛ بەم بۆنەوە؛ ساء دەسا؛ دەیسـا؛

پەوکیٚ؛ پەوکەی؛ لە بەر ئەمە؛ کە پیسەنە.

**لـه ــ لـه** / lahlah/: *صوت.* هەسـکە هەسـک؛ ئەنکەئەنک؛ هانکەهانک؛ هەنکەهەنک؛ هانەهان؛ هەنەهــەن؛ هینــەهین؛ هلکــەهلک؛ نخــەنخ؛ هەنەک ـ هەنەک؛ هەنک ـ هەنک؛ هن ــ هـن؛ هەن ــ هـەن؛ هەناسکەهەناسـک؛ خیتـەخیت؛ دەنگی هەناسەدانی بە تاو لـە دەمـەوە لـە بـەر ماندوو بوونی زۆر.

▣ **له ـ له زدن**: ١. هەنکەهەنک‌کـردن؛ هەناسـە دانی لە سەر یەک و بـە تـەوژمی سـەگ لـە گـەرمان ٢. *[کنـایی]* هەڵپەهەڵـپ کـردن؛ هینەهین‌کردن؛ پەلەکردن و هەوڵدانی زۆر بۆ وەچەنگ خسـتنی شـتێک ‹برای رسیدن به ریاست له ـ له مـی‌زد: بـۆ گەیشـتن بـە سـەرۆکی هەڵپەهەڵپی دەکرد›.

**له و لـورده** / leh-o-lavarde/: *صفت. [گفتاری]* پان و پلیش؛ پلیش‌ـ پلیش؛ پان و پلیخ؛ پلیش و پلیخ؛ پان و فلچ؛ پلیشاوە و لە بـیچم کـەوتوو ‹سیبها را زیر پا له و لورده کرد: سێوەکـانی لـە ژێـر پێدا پان و فلچ کردەوە›.

**لهو و لعب** / lahv-o-la'eb ، ـها/: [عربی]/*اسم.* کار و ڕەوتی ڕابواردن و خوشگوزەرانی زۆرتر نابەجیٚ و نەگونجاو (وەک قومار و شەراوخۆری).

**لهیـب** / lahîb/: [عربـی]/*اسم. [ادبی]* ١. بلێسـە؛ کڵپە؛ کرپە؛ گرێن؛ مەلاشە؛ نـێل؛ نێلـە؛ سۆڵـە؛ هێڵە؛ بلێزە؛ گڵ؛ گڕ؛ تلـە؛ گـڕی ئـاگر؛ گـوڕی ئێگر ٢. تین؛ تاو؛ گەرمای ئاور.

**لهیــدگی** / lahîdegî/:/*اسـم.* پـان و فلـچی؛ تلێقیــاگی؛ ژلیقــاوی؛ فلیقــاوی؛ پلیخــاوی؛ دافـەتاوی؛ داقنــاوی؛ هەڵژلـیویایی؛ پلـۆخاوی؛ پلیشاوی.

**لهیــدن** / lehîdan/: *مصـدر. لازم. [نامتـداول]* // **لهیدی**: فلیقایتەوە؛ **له میشوی**: ئەفلیقیتەوە؛ **له شو**: بفلیقێوە// فلیقانەوە؛ فلیقـان؛ فلێقـان؛ فلێقیـان؛ پلیشان؛ پلـیخان؛ پلۆخـان؛ هەڕشـان؛ ژلیقـان؛ ڤرچقین؛ شـلێقان؛ بەژڤـین؛ پـەلخین؛ توچـان؛ پــەلچقین؛ تلیقانــەوە؛ تولــخانەوە؛ داقنــان؛ دافرەتــان؛ پــەلخان؛ بــەژقین؛ شــلێقیەی؛ شــلێقیایوە؛ تلێقیــەی؛ پلــخان؛ پلــخانەوە؛ پوورخانــەوە؛ پەتشــان؛ پوورخــان؛ پــەرخین؛ مرچقین؛ پان/ فلچ بوونەوە. هەروەها: **لهیدنی**

■ صفت مفعولی: **لهیده**: (فلیقیاوە)

**لی** / lî/: [انگلیسی]/*اسم.* لی؛ ناوێکی بازرگـانی بـۆ جل و پۆشەنی جین.

**لیات** / liyāt/: [از انگلیسی] ☜ **صفحه‌آرایی**

**لیاقـت** / liyāqat ، ـهـا/: [عربـی]/*اسم.* شـایەنی؛ شـیاوی؛ هێژایـی؛ هـێگنی؛ عـورزە؛ ڕا؛ سـەوچ؛ سـەوچیایی؛ ژێهـاتوویی؛ زەرف؛ گێـر و فـەن؛ لێهاتوویی؛ لێهاتگی.

**لیبرال** / lîberāl ، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* لیـبراڵ؛ ئازادیخواز؛ هۆگر و لاگری لیبرالیسم.

**لیبرالـی** / lîberālî/: [فرانسـوی] *صفت.* لیبراڵـی؛ سەر بە لیبرالیسم.

**لیبرالیــــزم** / lîberālîzm/: [انگلیســــی] ☜ **لیبرالیسم**

**لیبرالیســـم** / lîberālîsm/: [فرانســوی]/*اسـم.* لیبرالیسـم؛ ئـازادیخوازی؛ ئـامۆژەی سیاسـی و ئـابووری کـە لـە سـەر ئـازادی و سـەربەخۆیی ئـابووری، کۆمەڵایـەتی و فەرهـەنگی تاکـەکانی کۆمـەڵ دەڕوا و بـەر بـە دەسـەڵاتی دەوڵـەت دەگریٚ: **لیبرالیزم**

**لیپاز** / lîpāz/: [فرانسوی]/*اسم. [فیزیولوژی]* لیپـاز: ١. ئانزیمی هەڵـتاوینی چەوری لە نێـو جـەرگ، پانکراس و ئەندامانی‌تـری کۆئەنـدامی هەرسـدا ٢. ـ/ـها/ ناوی گشتی بۆ ئانزیمگەلی هەڵـتاوین و شیکاری چەوری.

**لیپید** / lîpîd ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم. [شیمی]* لیپیـد؛ ماکی چەور بریتی لە چەوری، ئەسـیدی چـەور، ڕۆنی چەور و مۆم.

**لیتر** / lîtr/: [فرانسوی]/*اسم.* لیتر؛ یەکەی دێران لە

دەزگـای میتریـدا بەتایبـەت بـۆ پێـوانی تـراو، بەرامبەر بە ١٠٠٠ میلی‌میتری چوارپاڵوو.

**لیتوسفر** / lîtosfer/: [فرانسوی] ☜ **سنگ‌کره**

**لیتـوگراف** / lîtog(e)rāf ، ـها/: [فرانسـوی]/اسـم. لیتـۆگراف؛ ئـەوی پـەڕەی هەسـتۆکی کـانزایی (زینک/ پلەت) بۆ چاپ ساز دەکا.

**لیتـــوگرافی** / lîtog(e)rāfî/: [فرانسـوی]/اسـم. لیتۆگرافی: ١. کار و ڕەوتی سـازکردنی پـەڕەی هەستۆکی کانزایی بۆ چـاپ ٢. /ـها/ کارگـەی لیتۆگرافی.

**لیتـه** / lîte/:/اسـم. لیتـە؛ جۆرێـک ترشـی لـە باینجانەڕەشـەی ئـەنجنراوی دەنێـو سـرکەدا کولاو.

**لیتـــیم** / lîtiyom/: [فرانســوی]/اســم. لیتیـــوم؛ سۆکترین توخمی کانزا، بـە ژمـارە ئـەتومی ٣ و کێشـی ئـەتومی ٦،٩٤، کـە نـەرم و بـۆرە و لـە چێکردنی ئالیاژی زوو هەڵتاودا بە کەڵک دێت.

**لیچ** / lîč/: صفت. *[گفتاری]* لچق؛ لیچق؛ لیچ؛ لنج؛ لینج؛ تراوی خز و چەسپن.

▣ **لیچ افتادن:** لیق/ لیچـق/ لینـج بـوون ‹در آن گرما زیر بغـل و کشـالەی ران عـرق مـی‌کـرد و لـیچ می‌اُفتاد: لەو گەرمایەدا ژێر بـاڵ و بـنڕان ئـارەقی دەکرد و لیق دەبۆوە›.

**لیچار** / lîčār ، ـها/:اسم. *[گفتـاری]* تـەوزە؛ تیـز؛ قسەیێ کە بۆ تەشقەڵەکردنی کەسێ دەگـوترێ ‹کارش این است که پشت‌سر مردم لیچار بگوید: کـاری ئەوەیە پشتەسەری خەڵک تەوزە بکا›.

**لیـدر** / lîder ، ـها؛ ـان/: [انگلیسـی]/اسم. ڕێبـەر؛ ڕابەر؛ پێشەوا ‹لیدر حزب: ڕێبەری پارت›.

**لیدی** / leydî ، ـها/:[انگلیسی]/اسم. خاتوون؛ خان؛ باجی؛ خاد؛ خات؛ بانوو؛ کابان؛ خانمێ؛ خانمـە؛ خانم؛ دادێ؛ وشەی ڕێزنان لـە ژن لـە وڵاتـانی ئینگلیزی زماندا.

**لیر** / lîr ، ـها/:/اسم. لـیر: ١. [فرانسـوی از یونـانی] جۆرێک سازی ژێداری وەک چەنگ ٢. [انگلیسی] یەکەی پارەی ئیتالیا پێش یۆرۆ.

**لیـره** / lîre ، ـها/:[از لاتـین]/اسم. لـیرە؛ یەکـەی پارەی بریتانیا، ئیرلەند، میسر، سوودان، سووریە، لوبنان، تورکیە و قیـبرس، کـە هـەر کـام بـایی خۆیان هەیە.

**لیز** / lîz/: صفت. *[گفتاری]* خز؛ خژ؛ خاژ؛ خـەزگ؛ لووس؛ حولی؛ سڕ؛ خلیسک؛ خولیسک؛ خریک؛ تەهس؛ تەحس؛ شەمت.

▣ **لیـز خـوردن:** هەڵخلیسـکان؛ خلیسـکان؛ خلیســکیان؛ خلیســکین؛ خلیســەکان؛ ڤەخلیسکان؛ خـزان؛ خزیـان؛ زەلان؛ زەلـین؛ چـەڕخین؛ چلیـان؛ شـەمتین؛ خـەزمتین؛ خـریکین؛ خـاژبوون؛ خـڕگین؛ تەهسـین؛ تەحسین؛ خەشکین؛ فسکین؛ خزەی؛ خزای؛ دەرهەسین؛ شلەپین ‹زمین لیـز بـود، پایم لیـز خورد: زەوی خز بوو، هەڵخلیسکام›.

**لیزاب** / lîzāb/:/اسم. ١. *[گیاەشناسی]* لینجاو؛ لیق؛ لیقاوە؛ ماکێکی ژلەیی لە نێـو بـڕێ ڕوەکـدا بـۆ ڕاگرتنی ئاو ٢. تێکەڵاوێکی ئاودار لە جەوی یان مـاکی وا کـە لـە دروسـتکـردنی چەسـپ و دەرمانی ژانبڕدا بە کەڵک دێت.

**لیزر** / leyzer/: [انگلیسـی]/اسم. لـەیزر: ١. /ـها/ کەرەسـتەی بەرهـەمهێنانی تیشـکی لـەیزر ٢. تیشکی لەیزر.

**لیزرپرینتـــــر** / leyzerpirinter, -p(e)rînter/: [انگلیسی] ☜ چاپگر لیزری، **چاپگر**

**لیزری** / leyzerî/: [انگلیسـی]صفت. لـەیزری؛ بـە تایبەتمەندی کەڵک وەرگرتن لە تیشکی لەیزر.

**لیزی** / lîzî/:/اسم. خلیسکی؛ خزی؛ تەهسـۆکی؛ لووسی؛ چۆنیەتی خز بوون.

**لیزین** / lizîn/: [؟]/اسم. *[شیمی]* لیـزین؛ ئەسـید ئامینەیەکی گرینگ لە لەشدا کە کەم بوونەوەی دەبێتە هۆی نەخۆشیەکی زۆر.

**لیس** / lîs/:/اسم. لێس؛ لس؛ لست؛ لێسپ؛ کاری زمان بە شتێکا ساوین.

◘ لیس زدن: لێستنەوە؛ لستنەوە؛ لیستنەوە؛ لیسانەوە؛ لێسپ لێدان؛ لستن؛ لسین؛ لیستن؛ لێستن؛ لێس دان ‹دختربچە داشت بستنی‌اش را لیس می‌زد: کیژۆڵەکە خەریک بوو بەستەنیەکەی دەلیستەوە›.

**لیسانس** / lîsāns/: [فرانسوی]/اسم. کارناسی؛ لیسانس: ١. خولی خوێندنی باڵا لە چوارساڵدا ٢. ـ/ها/ بڕوانامەی کۆتایی ئەو قۆناغە لە خوێندن ٣. ـ/ها/ بڕوانامە.

**لیسانسیه** / lîsānsiye، ـها/: [فرانسوی] صفت. لیسانسە؛ کارناس؛ خاوەنی بڕوانامەی خولی لیسانس.

**لیست** / lîst، ـها/: [فرانسوی]/اسم. سیایی؛ سوورەت؛ لیست ‹لیست حقوق: سیایی مووچە›.

◙ لیست حقوق: سیایی مووچە؛ پێڕستێ کە ناوی مووچەخۆران و هەندی مووچەکانیانی تێدا دیاری کراوە.

**لیست سیاه**: لیستەی ڕەش؛ پێڕستی ناوی نەیاران یان تاوانباران.

**لیسک** / lîsak، ـها/:/اسم. شەیتانۆکە؛ شەیتانەکلە؛ هێلکەشەیتان؛ هێلکەشەیتانۆکە؛ کەسپک؛ قەپۆشکە؛ قەپووشک؛ قەپووچک؛ قەپووچکە؛ قاقلۆکە شەیتان؛ قاقلە جنۆکە؛ چەقچەقۆلە؛ مامفەتە؛ گیانداریکی چکۆلەی نێر- مێی شل و ولە بە قاپیلکەیەک لە کۆڵ و یەک یان دوو جوت شاخئاسا لە سەر سەری کە چاوی لە سەر جووتێکیانە: **حلزون**

**لیسه** / lîse، ـها/:/اسم. ١. مۆرد؛ لیسکە؛ ئامرازێکی زبرە بۆ لووس‌کردن ٢. ساوای جۆرێک پەپوولەی پچووکی سپی کە وەک کرم وایە و مێملی داری بەرداری وەک سێو، هەڵووژە و شێلانەیە.

**لیسیدن** / lîsîdan/: مصدر. متعدی. // **لیسیدی**: لێستتەوە؛ **می لیسی**: دەلێسیەوە؛ **بلیس**: بلێسەوە // لێستنەوە؛ لستنەوە؛ لێسانەوە؛ لیستنەوە؛ لستن؛ لێستن؛ لسین؛ لێستەی؛ لێستەیوە؛ والێستن؛ ڤەلیستن؛ ئالستن؛ ئالاستن؛ لێسان؛ لێسین؛ لشتش؛ لشتن؛ دالیستن؛ دالستن؛ لستەوپستەدان؛ لێسەی؛ لێسای؛ ئەوەلێسەی؛ لێسایوە: ١. لێسانەوە؛ شتێک بە زمان سڕین ‹ظرف لیسیدن: قاپ لستنەوە› ٢. لێسانەوە؛ لیستنەوە؛ زمان بە شتێکدا هێنان ‹مشغول لیسیدن ضریح بود: خەریک لێستنەوەی شباک بوو› ٣. ساویان؛ پێدا ساوین؛ تەقین؛ پێوە تەقین؛ بە حاڵ وێکەوتن ‹گلوله گونه‌اش را لیسیده بود: گوللە ساوبابووە گۆنایدا›. هەروەها: **لیسیدنی**

■ صفت فاعلی: **لیسنده** (لێسەر)/ صفت مفعولی: **لیسیده** (لێسراو)/مصدرمنفی: **نلیسیدن** (نەلستنەوە)

**لیف** / lîf، ـها/: [عربی]/اسم. ١. لیفە؛ لفکە؛ لیف؛ لیفکە؛ کیسەی پارچەیی بۆ خۆ شوتن ٢. [گیاه‌شناسی] ڕووشاڵ؛ پرووش؛ ڕیشاڵی تەسک و درێژی گیا ٣. تاڵی سروشتی یان دەسکردی خەڵەڵەی ناسک و درێژ (وەک تاڵی خورما، کەتان و...).

**لیفتراک** / lîft(e)rāk، ـها/: [از انگلیسی]/اسم. لیفتراک؛ کامیۆنێ کە بارهەڵگری لە سەر دامەزراوە و بە هێزی هیدرولیکی کار دەکا.

**لیفه** / lîfe، ـها/:/اسم. پزگ؛ پزوو؛ پسێ؛ پزی؛ پزە؛ نافەک؛ نیفۆ؛ نیفە؛ شوێنی تێ هەڵکێشانی بەن یان کێش لە گنج بەتایبەت شواڵدا.

**لیفی** / lîfî/: [عربی] صفت. لیفی: ١. وەکوو ڕیشاڵ ٢. چێکراو لە ڕیشاڵ.

**لیقه** / lîqe/: [عربی]/اسم. لێقە؛ لیقە؛ تاڵی خوری، پەشم یان زۆرتر هەورێشم بۆ هەڵمژینی مەرەکەفی ناو دەوات.

**لیک** / lîk/: [عربی] ☜ **لکن**

**لیکن** / lîken, lîkan/: [عربی] ☜ **لکن**

**لیکور** / lîkor/: [فرانسوی]/اسم. لیکۆر؛ جۆرە ئارەقێکی شیرین بە تامی میوە یان بەهاراتەوە.

**لیگ** / lîg، ـها/: [انگلیسی]/اسم. لیگ؛ خولێکی

کێبەرکێ لە ماوەیەکی دیاریکراودا بۆ ململانێ تاقمێ تیمی وەرزشی.

**لیگنیت** / lîgnît ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [زمین‌شناسی] لیگنیت؛ جۆرێک بەردەخەڵووزی قاوەیی بە تینی کەم و دووکەڵی زۆرەوە.

**لیلاج** / leylāc ، ـها/:/اسم. [کنایی] لەیلاج؛ قوماربازی زۆر لێزان.

**لیلکی** / lîlakî/ ☜ **لالکی**

**لی ـ لی** / leyley/:/اسم. ۱. ئێشقلکێ؛ ئیشقلکێ؛ هەنگڵەشەلە؛ هەنگەشەلێ؛ هەنگەشەلە؛ لنگەشەلێ؛ لنگەشەلە؛ قولەکانێ؛ ئێسترەشەلە؛ پێ‌پێ‌یانێ؛ چۆلانێ؛ چووزەکە؛ هنگ‌لنگ؛ گلێ؛ گەمەی لە سەر یەک پێ ڕویشتن: **آلنگه** ۲. ☜ **اکردوکر**

▣ **لی ـ لی کردن**: هەنگەشەلێ‌کردن؛ هنگ‌لنگ کردن؛ چۆلانێ‌کردن؛ قولان؛ بە یەک پا ڕۆیشتن ‹یک پایش را نمی‌توانست روی زمین بگذارد، موقع راه رفتن لی- لی می‌کرد: نەیدەتوانی پایەکی بنێتە زەوی، کاتی ڕویشتن هەنگەشەلێی دەکرد›.

**لی ـ لی** / lîlî ، ـها/:/اسم. ڕیشاڵە؛ بزگوڕ؛ ڕیشاڵی نەرم و ورتکە.

▣ **لی ـ لی بە لالای کسی گذاشتن**:[تعریض] جڵەو بۆ کەسێ شل کردن؛ دانە دەم کەسێکەوە؛ هاوڕایی‌کردنی کەسێ لە کار و کردەوەی زۆرتر ناڵەباریدا ‹گفتم این‌قدر لی- لی بە لا- لای این پسر نگذار پررو می‌شود: وتم ئەوندە جڵەو بۆ ئەم کوڕە شل مەکە ڕوودار دەبێ›.

**لیمو** / lîmû ، ـها/: [سنسکریت]/اسم. لیمۆ: ۱. ناوی گشتی بۆ تیرەیەک لە دار یان دارۆچکەی گوڵداری پەڕە گوڵ جیا-جیای تایبەتی ناوچەی شێدار یان گەرم بە گەڵای بونخۆشەوە ۲. ناوی میوەی هەر کام لەو دار و بنچکانە.

**لیموئی** / lîmû'î/: [سنسکریت] ☜ **لیمویی**

**لیموترش** / lîmûtorš ، ـها/: [سنسکریت/ فارسی] /اسم. مسکی؛ لیمۆترش/ تورش: ۱. داری لە بنەماڵەی پرتەقاڵ ۲. بەری ئەو دارە کە میوەیەکی ترش و دەنک تاڵە و پێستێکی ناسکی سەوز یان زەردی هەیە.

**لیموشیرین** / lîmûšîrîn ، ـها/: [سنسکریت/ فارسی] /اسم. لیمۆشیرین: ۱. داری لە بنەماڵەی پرتەقاڵ ۲. بەری ئەو دارە کە گەورەترە لە لیمۆترش و پێستی زەرد و ساف و ناسکە و ناوەکەی شیرین و ئاودارە.

**لیموعمانی** / lîmû'ammānî ، ـها/: اسنسکریت/ عربی]/اسم. لیمۆ عەممانی؛ جۆرێ لیمۆترشە کە وشک دەکرێ و بۆ تام، بە ساقی یان وردکراو، لە چێشتی دەکەن.

**لیموناد** / lîmûnād, lîmonād/: [فرانسوی]/اسم. لیمۆناد؛ نووشابەی گازدار لە ئاو، شەکر و گوشراوەی مزرەمەنی.

**لیمویی** [1] / lîmûyî/: [سنسکریت]/اسم. لیمۆیی؛ ڕەنگی زەردی کاڵ وەکوو ڕەنگی پۆستی لیمۆ شیرین: **لیموئی**

**لیمویی** [2]: صفت. لیمۆیی: ۱. بەڕەنگی زەردی‌کاڵ. هەروەها: **لیمویی‌رنگ** ۲. بە تامی لیمۆ * **لیموئی**

**لینت** / lînat/: [عربی]/اسم. ۱. نەرمی؛ نەرم و نۆڵی ۲. [مجازی] ڕەوانی؛ قڕۆ (بۆ کاری زگ).

**لیوان** / lîvān ، ـها/:/اسم. لیوان؛ لێوان؛ لیمان؛ شەربە؛ پەرداخ؛ ئاوەوەرە؛ دەفرێکی گرۆڤەری زیاتر لە شیشە بۆ خواردنەوەی تراوی وەک ئاو و شەربەت و...

**لیوانی** / lîvānî ، ـها/: صفت. لیوانی؛ لێوانی؛ پەرداخی؛ بە لیوانەوە؛ لیواندار ‹بستنی لیوانی: چلوورەی لیوانی›.

**لیوانی** / lî:vānî/: قید. لێوانی؛ لیوانی؛ پەرداخی؛ بە لێوان؛ بە پەرداخ: ۱. لە لێواندا ‹آب انجیر را لیوانی می فروشند: ئاو هەنجیر لیوانی دەفرۆشن› ۲. لێوانێک؛ لیوانێک؛ لێوانێو؛ هەر لێوان ‹لیوانی صد تومان: لیوانی سەتمەن›.

# م

م[1] / m/: *حرف.* م؛ نیشانەی بیست‌وهەشتەمین پیتی ئەلف‌وبێتکەی زمانی فارسی.

م ـ[2]: *پیشوند.* مـ ؛ بێ‌واتای هاوڕێ دروست دەکا ‹درـ مر؛ کُلاهـ مُلاه: درگا و مرگا؛ کلاو ـ ملاو›.

م / me/: *اسم.* ۱. مێ؛ میم؛ ناوی بیست و هەشتەمین پیتی ئەلف‌وبێ فارسی ۲. *[مخفف]* ز؛ زایینی ‹سال ۱۷۸۹ م: سالی ۱۷۸۹ ز›.

م ـ / ma/: *پیشوند.* مەـ ؛ بە سەرەتای کرداری فرمانەوە دەلکێ و کرداری بەرگر دروست دەکا ‹مرو؛ مخور: مەچۆ؛ مەخۆ›.

ـ م / am/: *ضمیر.* ـ م: ۱. ـ ا؛ ـ نێ؛ ـ انێ؛ جێناوی لکاوی یەکەم کەسی تاک ‹آمدم: هاتم› ۲. جێناوی لکاوی خاوەنیەتی بۆ یەکەم کەسی تاک ‹کتابم؛ دستم: کتێبەکەم/ کتێبم؛ دەستم› ۳. جێناوی لکاوی بەرکاری بۆ یەکەم کەسی تاک ‹آوردندم اینجا: بۆ ئێرەیان هێنام›.

ـ م / om/: *پسوند.* ـ هەم؛ ـەم؛ ـ م؛ ـ وم؛ ـ هوم؛ نیشانەی ژمارەی ڕیزکراو ‹دوم؛ صدم: دووهەم؛ سەدم›.

ـ مآب / ma'āb/: [عربی] *پیوازه.* ـ ئاسا؛ ـ ڕەنگ؛ شێوەـ؛ لە ڕواڵەت و کردەوەدا وەکوو کەس یا شتی‌تر ‹شترمآب: وشترئاسا›.

**مآخذ** / ma'āxez/: [عربی] جمعِ ☜ **مأخذ**

**مآل** / ma'āl/: [عربی]*اسم. [ادبی]* ئاکام؛ سەرەنجام؛ دوائاکام؛ ئامانج؛ چارەنووس.

**مآلاً** / ma'ālan/: [عربی] *قید. [ادبی]* دواجار؛ لە ئاکامدا؛ دواخری؛ دوائاخری؛ ئاخری؛ لە سەرەنجامدا ‹اکنون هر بذری بکاری، مآلاً برداشت خواهی کرد: ئێستا هەر توویەک بچێنی، دواجار دەیچنیەوە›.

**مآل‌اندیش** / ma'ālandîš ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دوانوار؛ دوورنوار؛ دوابین؛ تێ‌بین؛ دووربین؛ دوورئەندێش؛ لێهاتوو لە هەڵسەنگاندن و لێکدانەوەی دوارۆژی کار و باران. هەروەها: **مآل‌اندیشی**

**ما** / mā ، ـها/: *ضمیر.* ئێمە؛ ئیمە؛ ئەمە؛ مە؛ هەمە؛ ئەم؛ مۆ؛ جێناوی ئاماژە بۆ یەکەم کەسی کۆ ‹ما رفتیم: ئێمە چووین›.

⊡ **ما و شما نداشتن:** ئێمە و ئێوە(ی بۆ) نەبوون؛ من و تۆ نەویستن؛ جیاییەک نەبوون؛ ماڵ‌جیایی لە نێواندا نەبوون؛ زۆر لەگەڵ یەک دۆست و لە باری ماڵیەوە تێکەڵ بوون (هەر بۆ یەکەم کەسی کۆ بەکار دەچێ) ‹ من هم هر چه دارم مال شماست، ما که ما و شما نداریم: منیش هەر چیم هەیە هی ئێوەیە، ئێمە و ئێوەی نیە›.

**ماالشعیر** / mā'ošša'îr/: [عربی]*اسم.* بیرە؛ خواردنەوەیەکی گازداری بێ‌ئەلکولە لە شیرەی چەکەرەی جۆ سازی دەکەن: **ماءشعیر**

**مائــده** / mā'ede ، ــها/: [عربـی] /اسـم. [ادبـی/ ۱. خواردەمــەنی؛ پێخــۆر ۲. /قــدیمی/ ســفرە؛ خوان.

**ماءشعیر** / mā'ešaʾîr/: [از عربی] ☜ **مااَلشَّعیر**

**مائوئیسم** / mā'o'îsm, mā'u'îsm/: [فرانسوی] /اسم. مائۆئیســم؛ ڕێبــازی سیاســی مــائۆ تســە تونــگ (۱۸۹۳ـ ۱۹۷٦ ز.)، ڕێبەری کۆمۆنیستی چین کە لە مارکسیسم ـ لینینیســم هەڵــیهێنجاوە (وەک شۆڕشــی وەرزێــری، شــەڕی چەکــداری و جــەهانی سێجەمسەری).

**مــائوری** / mā'orî/: /اســم. مــائۆری: ۱. خەڵــکی زاگەیی نیوزیلەند ۲. /ـها/ هەر کام لــە کەسانی ئەو خەڵکە ۳. زمانی ئەو خەڵکە.

**مابعد** / māba'd/: [عربـی] صفـت. دوایـی؛ دواتــر؛ دماتەر؛ لە دواوە ‹صفحەهای ماقبـل و مابعـد را هــم ببینید: لاپەڕەکانی پێشوو و دواییش ببینن›.

**مابعدالطبیعــه** / māba'dottabî'e/: [عربـی] /اســم. ژوورەسروشـــــت؛ بەشـــێک لـــــە فەلســـــەفەی ئەرەســتوویی کــە لــە ســەر چییــەتی جــەهان، ناسیاری و ڕاستەقینە دەکۆڵێتەوە.

**مابعدالطبیعی** / māba'dottabî'î/: [عربـی] صفت. ژوورەسروشتی؛ سەر بە ژوورەسروشت.

**مابقی** / mābaqî/: [عربی] /اسم. پاشماوە؛ بــەرماو؛ باقی؛ ئەوەی لــە بــەر شــتێ مابێتــەوە ‹مـابقی را بفروشید: پاشماوەکەی بفرۆشن›.

**مابه ازا** / mābe'ezā/: [عربی] حرف. /نامتـداول/ لــە بــاتی؛ بــۆ؛ لــە بــەری؛ لــە بــری؛ لــەجیاتی؛ لــە بەرانبەری؛ لە جێی؛ جیاو؛ بە جێگەی ‹ صد هزار تومان مابەازای مـزد یـک هفتـه پرداخـت شـود: ســەت هەزار تمەن لە باتی مزی یەک حەوتە بدرێ›.

**مابه التفــاوت** / mābehottafāvot/: [عربـی] /اسـم. ســەرباقی؛ بــاقی؛ پاشمــاوە؛ ئــەوەی کــە هــۆی جیاوازی شــتێک لەگــەڵ شــتێکیتردایــە (وەک هەرزانی، گــرانی، زۆری، کــەمی، چــاکی یــا خراپــی و...) ‹اتــومبیلم را عــوض کــردم و یــک میلیــون هــم مابەالتفاوت دادم: ماشینەکەم گۆڕیەوە و ملیــۆنێکیش سەرباقیم دا›.

**مابین** / mābeyne/: [عربی] حرف. نێوان؛ ناڤبەین؛ بەین؛ نــاونی؛ لەبــەنی؛ ناوبــەینی؛ ناڤــبەر؛ میــۆ؛ مێون؛ دوڕ؛ لەناو؛ لە نێوانی دوو یا چەنــد کــەس یا شتدا ‹مابین آنها اختلاف بود: نێوانیان کێشە بوو›.

**مات**[1] / māt/: /اسم. مات: ۱. دۆخی کــش بــوونی شای شەترەنج بە جۆرێ کە ڕێی دەربــاز بــوونی نەبێ ۲. [فرانسوی] بەرهەمی توانەوەی کانەگەلی گۆگرددار.

▣ **مات شدن**: مات بوون؛ شا ترنجیــان؛ دۆڕانی کایەی شەترنج.

**مات کــردن**: مــاتکــردن؛ بردنــەوەی کایــەی شەترنج.

**مات**[2]: صفت. مــات؛ مــت: ۱. واقوڕمــاو؛ دوش؛ دژداماو؛ دوشداماو؛ دژ؛ بە چڕ و چاوی شــێواو و سەرســام لــە بــەر کێشــەیەکی زەیــنی یــان ڕووداوێکــی ڕەچــاو نــەکراو ۲. دامــاو؛ دامــاگ؛ تێماو؛ حەیران؛ داهێزاو و بڕیار لێبڕاو بــە هــۆی بار و دۆخێکی دژوارەوە ‹با این بیپولی، بیکـاری و مریضی زنم، مات مانـدەام و نمـیدانـم چـه بکـنم: بــەم دەســتەنگی و بێکــاری و ژن نەخۆشــیەوە، دامــاوم، نــازانم چ بکــەم› ۳. [فرانســوی] تــار؛ تاریــک؛ بــە چەشنێ کە تــەنیا بەشــێک لــە تیشــک لێیــەوە دەربــاز ببــێ ‹شیشــەی مــات: شیشــەی مــات› ٤. [فرانسوی] بێبریقە ‹رنگ مات: ڕەنگی مات›.

▣ **مات بــردن کســی را**: واق وڕمــانی کەســێک؛ سەرسام بوونی کەسێ؛ مات بوونی کەســێک؛ تەواسان؛ حەپەسان ‹چرا ماتت بردە؟: لە چی واق وڕ ماوی؟›.

**مــات مانــدن**: واقوڕمــان؛ حــەیران مــان؛ حەپەسان؛ تێدامان.

**ماتادر** / mātādor ، ـها/: [اسپانیایی] /اسـم. گاوبــاز؛ ئەوەی بۆ خۆشی لەگەڵ گادا بە شەڕ دێت.

**ماتحت** / mātaht/: [عربی] /اسم. [ادبـی/ ۱. ژێرین؛

خوارین؛ وارین؛ چێرین؛ خوارگین؛ ژێروو؛ ژێرن؛ خوارن؛ ئەوەی لە ژێر یا لە خوارەوە بێ ٢. /ـها/ *[مجازی]* سمت؛ کلۆک؛ سورین؛ پاشڵ؛ کەماخ؛ کولمیک؛ تەراف؛ کەفەڵ؛ لاقوونگ.

**ماترک** / mātarak /: [عربی]/اسم. کەلەپوور؛ مەردەلا؛ کەلەپور؛ شرە؛ میرات؛ ئەوەی لە کەسێکەوە، بەتایبەت دوای مردنی بە جێ دەمێنێ.

**ماتریالیزم** / māteryālîzm /: [فرانسوی] ☜ **ماتریالیسم**

**ماتریالیست** / māteryālîst /: [انگلیسی] *صفت.* ماتریالیست: ١. /ـها/ هۆگر و شوێنکەوتووی ماتریالیسم ٢. ☜ **ماتریالیستی**

**ماتریالیستی** / māteryālîstî /: [انگلیسی] *صفت.* ١. ماتریالیستی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ماتریالیسمەوە: **ماتریالیست**

**ماتریالیسم** / māteryālîsm /: [فرانسوی]/اسم. ماتریالیسم؛ ڕێبازێکی فەلسەفی کە ماک بە ڕاستیەکی ئەزەلی و بنەڕەتی دەناسێت و هەموو هەبوو، ڕووداو و دیاردەکانی جیهان و ژیان بە بەرهەمی ئەوە دەزانێت: **اصالت مادە؛ مادەگرایی؛ مادیگری؛ ماتریالیزم**

▣ **ماتریالیسم تاریخی:** ماتریالیستی مێژوویی؛ ڕێبازی فەلسەفی مارکس کە هەموو گۆڕانکاریەکی کۆمەڵگا و ڕەوتی مێژوو بە بەرهەمی کۆمەڵە قانوونی داسەپاو بە سەر ماکدا دەزانێ. گۆڕانی کۆمەڵگا دەکێشێتەوە سەر گەشەی ئامێر و ئامرازی بەرهەم هێنان و فەرهەنگ و هەروەها ئاکار و قانوون بە ڕاژێری بار و دۆخی ئابووری کۆمەڵگا دەناسێت.

**ماتریالیسم دیالکتیک:** ماتریالیسمی دیالکتیک؛ ئامۆژەی فەلسەفی مارکسیسم کە جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە جەهان تەنیا ماکە و بێجگە لە ماک چی دی نیە و قانوونی بزاڤ و گۆڕانکاری بە سەر هەموو شتێکدا زاڵە.

**ماتریس** / mātrîs ، ـها /: [فرانسوی]/اسم. ١. چوارچێوە؛ قالب؛ قالک ٢. *[ریاضی]* ماتریس؛ شێوازەیەکی زانستی بیرکاری، کاتێ چەندێتی چەند ڕەقەم بەسرابێتنە یەکەوە.

**ماتم** / mātam /: [عربی]/اسم. سوێ؛ سووە؛ سۆ؛ ئازیەت؛ ئازیەتی؛ ئازیەتباری؛ تازیە؛ تازی؛ تازیەباری؛ تازیانە؛ تازیمانە؛ مردەمو؛ بەهی؛ بنهاری.

▣ **ماتم گرفتن:** *[مجازی]* تازیەگرتن؛ خەمبار/ ئازیەتبار/ تازیەبار بوون؛ شین گێڕان؛ خەم داگرتن؛ خەمین بوون ‹برای یک تکە پارچە این‌طور ماتم گرفتەای؟!: بۆ لەتە پارچەیەک وا تازیەت گرتووە؟!›.

**بە ماتم نشستن:** ئازیەتبار/ خەمبار بوون؛ تازیەگرتن؛ شین گێڕان ‹مردم در مرگ او بە ماتم نشستند: **خەڵکی لە مەرگیدا** ئازیەتبار بوون›.

**ماتمزدە** / mātamzade ، ـها؛ ـگان /: [عربی/ فارسی] *صفت.* ئازیەتبار؛ مردەمودار؛ تازیەبار: ١. خۆشەویستمردوو؛ مردوومراو؛ ماتەمین ‹پسرش مردە، ماتمزدە است: کوڕەکەی مردووە، تازیەبارە› ٢. *[مجازی]* خەمبار؛ خەمین؛ زۆر بە پەژارە ‹این قیافەی ماتمزدە چیست بە خودت گرفتەای؟: ئەم چروچاوە تازیەبارە چیە لە خۆتت دەرهێناوە؟›.

**ماتمسرا** / mātamsarā /: [عربی/ فارسی] ☜ **ماتمکدە**

**ماتمکدە** / mātamkade /: [عربی/ فارسی]/اسم. ئازیەتگا؛ پرسەخانە: ١. جێ پرسە؛ جێگەی پرسە و تازیە ٢. *[کنایی]* جێگای پڕخەم و پەژارە؛ شوێنی زۆر داگیراو و پەژارەهێن ✽ **ماتمسرا**

**ماتیک** / mātîk /: [فرانسوی]/اسم. ماتیک: ١. ماکێکی چەوری زۆرتر ڕەنگی، بۆ ڕازاندنەوە و جوان کردنی لێو، کە لە دەفرێکی وەک لوولەدایە ٢. /ـها/ ڕۆژ؛ ئەو ماکە و جێگاکەی.

**ماجرا** / mācarā ، ـها /: [عربی]/اسم. ڕووداو:

۱. کار ‹ماجرای خریدن خانه به کجا کشید؟: کاری ماڵ سەندن گەیشتە کوێ؟› ۲. کار و ڕەهات؛ ڕووداوی پڕ کارەسات ‹آن شب ماجرایی داشتیم، که مپرس!: ئەو شەوە کار و ڕەهاتێکمان بوو، نەبێتەوە!›.

**ماجراجو** / mācarācû ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* گوڕێخ؛ گورخ: ۱. خاوەن خووی یان ئۆگرەتی بە شەڕ و هەرا و بشێوە ۲. *[مجازی]* ئاژاوەگێڕ؛ دڕ و شەڕانی.

**ماجراجویی** / mācarācûyî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* گوڕێخی؛ گورخی؛ هەوڵ بۆ کارەسات نانەوە و خۆ تێ‌هەڵقورتانی.

**مأجور** / ma'cûr/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* خەلاتبەر؛ شیاوی ڕێز و خەلات.

**ماچ** / māč ، ـها/: [کردی] *اسم.* *[گفتاری]* ماچ؛ ماچە؛ مۆچ؛ ماچۆ؛ پاچ؛ مووچ؛ ماچک؛ میس؛ مووس؛ ڕامووس؛ ڕامووز؛ ڕامیس؛ ڕامووسانک.

⊡ **ماچ دادن:** ماچ دان؛ بەرایی دان بۆ ڕامووسان ‹بیا به عمو یک ماچ بده!: وەرە ماچێک بدە بە مامت!›.

**ماچ کردن:** ماچ‌کردن؛ ڕامووسان؛ ڕامووسین؛ میسان؛ ڕامیسین؛ لەوپادایش؛ پاچ‌کرن ‹برو دست بابا بزرگ را ماچ کن!: بچۆ دەستی باوەگەورە ماچ بکە!›.

**ماچ و بوسه** / māč-o-bûse ، ـها/: [کردی/ فارسی] *اسم.* *[گفتاری]* ماچ و مووچ؛ ماچماچان؛ کاری یەکتر ماچ‌کردن ‹ماچ و بوسەی خداحافظی تمام شد و راه افتادیم: ماچ و مووچی مالاوایی دوایی هات و کەوتینە ڕێ›.

**ماچ و موچ** / māč-o-mûč/: [کردی] *صوت.* ماچ و مووچ؛ ملچی؛ فلچەفلچ؛ دەنگی ماچ‌کردنەوە.

**ماچه** / māče ، ـها/: *اسم.* *[گفتاری]* ما؛ مێ؛ ماچە؛ ماچەک؛ ماچکە؛ دێڵە؛ دەڵە؛ مێوینەی بڕێ گیاندار ‹ماچه الاغ: ماکەر›.

**ماحصل** / māhasal/: [عربی] *اسم.* ئاکام؛ بەرهەم؛ حاسڵ؛ ئەو شتەی بە دەست هاتووە ‹ماحصل بحث این شد که باید شرکت را منحل کرد: ئاکامی باسەکە بوو بەوە کە پێویستە بەشدارگە هەڵوەشێتەوە›.

**ماحضر** / māhazar/: [عربی] *اسم.* حازر؛ کورتۆڵ؛ ئەو شتە لە بەر دەستدایە، بەتایبەت خواردنێک کە لە پێشەوە ئامادەکراوە ‹نهار برویم خانەی ما، ماحضر هرچه بود با هم می‌خوریم: نیوەڕۆ بچینەوە بۆ ماڵی ئێمە، چی حازر بوو پێکەوە دەیخۆین›.

**مأخذ** / ma'xaz ، ـها؛ مآخذ/: [عربی] *اسم.* ۱. سەرچاوە؛ سەرچاوکە؛ نووسراوە یان کەسێ کە باسێکی لێ دەگێڕنەوە ‹برخی نویسندگان مأخذ نوشتەشان را ذکر نمی‌کنند، برخی دیگر مأخذی را می‌دهند که اصلاً ندیده‌اند!: بەشێک لە نووسەران سەرچاوەی نووسراوەکانیان نانووسن، بەشێکی دیکەش سەرچاوەیەک ناو دەبەن کە هەر نەیاندیوە!› ۲. بنەما؛ ئەوەی دەبێتە بنەڕەتی حیساب‌کردن ‹مأخذ محاسبەی شما چیست؟: بنەمای حیساب کردنی ئێوە چیە؟›.

**مأخوذ** / ma'xûz/: [عربی] *صفت.* وەرگیراو؛ هەڵگیراو؛ هەڵگرتە.

⊡ **مأخوذ به حیا شدن:** لە ڕوو دامان؛ کەوتنە/ کەفتنە ناو ڕوودەربایسی.

**مادام**[1] / mādām ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* مادام؛ (بۆ ژنانی ناموسڵمان دەگوترێ) ‹مادام بواری از رمان‌های گوستاو فلوبر است: مادام بواری لە ڕۆمانەکانی گوستاو فلۆبرە›.

**مادام**[2]: [عربی] *قید.* هەتا؛ تا؛ ماوەیەکی دیاری نەکراو ‹مادام بترسیم همین است: هەتا بترسین هەر ئەمەیە›.

⊡ **مادام/ مادامی که:** تا کاتێک؛ تا ئەوکاتەی؛ تا وایە؛ هەتا ئاوایە ‹مادام که اینجایی، در خانەی ما بمان: تا کاتێک لێرەی، لە ماڵی ئێمە بمێنەوە›.

**مادام‌العمر** / mādāmol'omr/: [عربی] *قید.* تەواوی ژیان؛ تا دواکاتی ژیان؛ هەتا دوا ساتی تەمەن ‹مادام‌العمر در آنجا زندگی کرد: تەواوی ژیانی

لەوێ ژیا›.

**مادر** [1] / mādar ، ـها؛ ـان/:اسم. دایک؛ دایە؛ دێ؛ دی؛ دا؛ ئامە؛ دالک؛ دالگ؛ دادیک؛ ئـەدا؛ وەدا؛ ئانە؛ ئەوا؛ دادە؛ دیا؛ چا؛ داک؛ داکۆ؛ ماک؛ ماکە؛ یاک؛ یایە؛ یادێ؛ یایک؛ جێ؛ جیا؛ مایە؛ مایـەر؛ مای؛ مەتەر؛ دەیک؛ دای: ۱. گیانـداری مێوینـە (بەتایبەت مرۆ) کـە بێچـووی هەیـە ۲. *[مجازی]* ئەوەی شتێکی بەدیهێناوە یان بەخێوی کردووە ‹مادر روزگار: دایکـی ڕۆژگـار› ۳. پـووری؛ میمـی؛ نازنـاوی بـە خۆشەویسـتی و ڕێـزەوە بـۆ ژنی بەساڵاچوو.

▣ **مادر بچه‌ها:** *[گفتاری]* دایکی منـداڵان؛ دایـک مناڵەکان؛ ئاماژەی پیاو بۆ ژنەکەی ‹مادر بچه‌ها مریض است: دایکی منداڵەکان نەخۆشە›.

**مادر رضاعی:** دایکی شیری؛ ژنێـک جگـە لـە دایک کە شیری بە کەسێ دابێ.

**مادر روحانی:** دایکی ڕۆحـانی؛ ڕێزناوێـک بـۆ ژنی لە خواترسی کڵێسە: **مادر مقدس**

**مـادر فـولاد زره:** *[کنـایی]* دەمامـەی جـادوو؛ پیرەزاڵ؛ کۆنەفرتۆڵ؛ پیرەی فەرهادکوژ؛ پیرە ژنی ڕەزاگران و تەژە.

**مادر مقدس** ☜ **مادر روحانی**

**مادر ناتنی:** زڕدایک؛ زڕداک؛ زڕدێ؛ زڕداڵـک؛ بـاوەژن؛ بـاوەژەنی؛ دێمـاری؛ دێـدێ؛ ژنی باوک، بێجگە دایک.

▣ **مادر شدن:** بـوون بـە دایـک؛ بیـەی ئـەدای؛ منداڵ هێنانە دنیا.

**مادر** [2]: *صفت.* سەرەکی؛ سەرەتایی ‹کارخانەی مادر: کارخانەی سەرەکی›.

**مادرانـدر** / mādarandar ، ـها/:اسم. بـاوەژن؛ زڕدایک؛ زڕداک؛ دێدێ؛ ژنباب.

**مادرانه** [1] / mādarāne/: *صفت.* دایکانە؛ ئەدایانـە؛ زۆر مێهرەبانانە و بە سـۆز، وەک دایـک ‹محبت مادرانە: خۆشەویستی دایکانە›.

**مادرانـه** [2]: *قید.* دایکانـە؛ ئەدایانـە؛ وەک دایـک، ژیرانە و بە بەزەییەوە ‹با او مادرانـه رفتـار مـی‌کـرد: دایکانە بە دەوریدا دەهات›.

**مادربزرگ** / mādarbozorg ، ـهـا/:اسم. نەنـە؛ نەن؛ نەنک؛ مامـا؛ دایەگـەورە؛ دادا؛ ددا؛ داپـیر؛ داپیرە؛ پیرەدا؛ پیرک؛ داپـیرک؛ دایکـان؛ داگـا؛ نینی؛ دایکی دایک یان دایکی باب.

**مادرتباری** / mādartabāri/:اسم. *[جامعه‌شناسـی]* دایکڕەگەزی؛ نـەزم و دووزمـەیێ کـە منـداڵ دەداتـە پـاڵ دایـک و بنەماڵـەی دایکیـەوە. بەرانبەر: **پدرتباری**

**مادرجد** / mādarcad ، ـها/: [فارسی/ عربـی] /اسم. ئانە؛ داپیرە گەورە؛ دایەخانم؛ دایکی دایە گەورە یان دایکی بابە گەورە.

**مادرچـاه** / mādarčāh ، ـهـا/:اسم. دایکـەبیر؛ بیری سەرەکی کە ئاوەڕۆی کارێز لەوێوە دەست پێدەکا.

**مـادرخرج** / mādarxarc ، ـهـا/: [فارسـی/عربـی] /اسم. خاوەن دەخڵ؛ ئەوەی خەرجی کۆمەڵێ، لە سەفەر یان کارێکی بەکۆمەڵدا دەگرێتە گـەردن و دواخری سەرجەمی خەرجەکان دابەش دەکـا و بەشــە خــەرجی هــەر کەسـێکی لــێ دەستێنێتەوە.

**مادرخوانـــده** / mādarxānde ، ـهـــا/:اسـم. ۱. زڕدایـک ۲. دایگـان؛ ژن یـان کچـێ کـە منداڵێک وەردەگرێ و بە خێوی دەکا.

**مادردار** / mādardār/: *صفت.* دایکـدار؛ ئـەدادار؛ خاوەن دایک.

**مادرزاد** / mādarzād/: *صفت.* زگماک؛ سکماک؛ لەماوەرد؛ پێوەندیدار یا سەر بە کاتی لـە دایـک بوون ‹کوری مادرزاد: کوێری زگماک›.

**مـادرزادی** / mādarzādi/: *صـفت.* زگمـاکی؛ سکماکی؛ لەماوەری؛ دۆخ یان چۆنیەتی زگماک بوون.

**مـادرزن** / mādarzan ، ـهـا/:اسم. خەسـوو؛ خەسی؛ خوەسوو؛ خەسیرە؛ خەسوورە؛ هەسرەو؛

هەسروە؛ هوسیرەما؛ خواسی؛ خۆسسی؛ هیلک؛ داژەن؛ دایکی هاوسەری پیاو.

**مادرسالاری** / mādarsālārî/: *اسم. [جامعه شناسی]* دایکمەزنی؛ دووزەنەیەکی کۆمەلایەتی کە تێیدا ژن/ دایک سەرۆکی بنەماڵەیە و مێرد و منداڵانی بەڕێوە دەبا، منداڵ دەگەڕێتەوە سەر بنەمای دایک و ژنان کار و باری کۆمەڵگایان بە دەستەوەیە.

**مادرسرائی** / mādarsarā'î/ ☜ **مادرسرایی**

**مادرسرایی** / mādarsarāyî/: *اسم. [جامعه‌شناسی]* شێوازێکی کۆمەلایەتی کە مێرد دەچێتە ناو خێڵی ژنەکەی و لەگەڵ ئەواندا دەژی: **مادرسرائی**

**مادرشوهر** / mādaršowhar, -šo:har ، ـها؛ ـان/: *اسم.* خەسوو؛ هەسوو؛ خوەسوو؛ هەسرەو؛ هەسروە؛ خواسی؛ خۆسسی؛ هیلک؛ دایکی هاوسەری ژن.

**مادرشهر** / mādaršahr ، ـها/: *اسم.* دایکەشار: ۱. گەورەشار؛ شارمەزن؛ شاری سەرەکی پارێزگا یان ولاتێک ۲. *[قدیمی]* زێد؛ شار یان ولاتی سەرەکی خێڵی کۆچەر.

**مادرکلید** / mādarkilîd, -kelîd ، ـها/: [فارسی/ یونانی] ☜ **شاه‌کلید**

**مادرمرده** / mādarmorde/: *صفت.* دایکمردوو؛ دایکمردگ؛ دالکمردی: ۱. ئەدامەردە؛ بێدایک؛ تایبەتمەندی کەسێ کە دایکی مردووە ‹مثل بچه‌های مادرمرده زار ـ زار گریه می‌کرد: وەک منداڵی دایکمردوو هۆن ـ هۆن دەگریا› ۲. *[ـها/] [کنایی]* داماو؛ بەدبەخت؛ بێچارە ‹این مادرمرده که گناهی نداشت: ئەم داماوە خۆ سووچێکی نەبوو›.

**مادروار** / mādarvār/: *قید.* دایکانە؛ ئەدایانە: ۱. وەکوو دایک ۲. *[مجازی]* زۆر مێهرەبانانە.

**مادری**[1] / mādarî/: *اسم.* دایکی؛ داکێتی؛ دایکێتی؛ دالکێتی؛ دایتی: ۱. بار و دۆخی دایک بوون ۲. *ـها/[مجازی]* چاکە و بەزەیی دایکانە ‹او در حق همه مادری می‌کرد: ئەو بۆ هەمووان دایکی دەکرد›.

▣ **مادری کردن**: دایکی‌کردن؛ دایکێتی‌کردن؛ ئەدایی کەردەی؛ وەک دایک جووڵانەوە.

**مادری**[2]: *صفت.* دایکی؛ دایکێتی؛ پێوەندیدار یان سەر بە دایک ‹خانواده‌ی مادری: بنەماڵەی دایکی›.

**مادریار** / mādaryār/ ☜ **پدریار**

**مادگی** / mādegî/: *اسم.* ۱. مێوینەیی؛ مێوینەتی؛ مایەنی؛ مێیاتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی مێ بوون ۲. *ـها/* قوولکە؛ چاڵی؛ جێ قوتکە؛ نیوە یان بەشێکی کون یان قووپاو لە شتێ کە بەشێکی قوتی تێدەچێ یان تێدا گیر دەبێ ‹مادگی تکمه: قوولکەی دووگمە› ۳. *ـها/ [گیاه‌شناسی]* مێوینەیی؛ مێوینەتی؛ ئەندامی مێوینەی گوڵ.

**مادمازل** / mādmāzel/: [فرانسوی] ☜ **مادموازل**

**مادموازل** / mādmāzel ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* مادمازل؛ کچێ؛ کەنیشکە؛ سەرناوێ بۆ بانگ کردنی کچان: **مادمازل**

**مادون** / mādûn/: [عربی] *صفت.* خواردەست؛ ژێر؛ خاوەن پێگە و پلەی خوارتر ‹کارمند مادون: کارمەندی خواردەست›.

**مادون** / mādûne/: [از عربی] *حرف.* ژێرەوەی؛ ژێری؛ خوار ‹مادون قرمز: ژێرەوەی سوور›.

▣ **مادون قرمز** ☜ **فروسرخ**

**ماده**[1] / māde/: *اسم.* ما؛ مێوینە؛ مێ؛ نێ؛ ماچە؛ مێچکە؛ مێنگە؛ هێمان؛ بەشێ لە گیانداران کە ئاوس دەبن و زاوزێ دەکەن. بەرانبەر: **نر**

**ماده**[2]: *صفت.* مێ؛ مێو؛ ما؛ مایەن؛ ماک؛ مایک؛ مایکە؛ ماچە؛ مێچکە؛ مۆن؛ سەر بە گیانداری مێوینە.

**ماده** / mādde ، ـها؛ مواد/: [عربی] *اسم.* ۱. ماک؛ هێسن؛ تەنی سروشتی کە وێڕای وزە، دیاردە و بوونەوەرەکانی جیهان پێک دێنێ ۲. ماک؛

ئـه‌وه‌ی شـتێکی سروشـتی لـێ‌دروسـت بـووه ۳. ماده؛ بڕگه؛ بەند؛ بەشی جیاواز و دیاریکراو لە نووســراوەیەکی فــەرمی کـــە بـــە ژمـــارە دیاری‌کراوە ‹طبق مادەی ۴ قرارداد: بەرامبەر بە مادەی ٤ی بڕیارنامە›.

▣ مادەی اولیـه: کاڵەدەنـد؛ مـاکی سـەرەتایی؛ ئەوەی کـە بـۆ دروسـت‌کـردن و سـازکردنی کاڵایەک پێویستە.

مادەی حاجب: *[پزشکی]* مـاکی ئۆپـاک؛ ئـەو ماکە تیشـکی ئـیکس دەگریتـە خـۆی (وەک سولفاتی باریوم) کە لە ڕادیۆلۆژیدا بە کار دێت.

مـــادەی خاکســتری: *[کالبدشناســی]* شـــانەی دەماری مێشک کە بۆر و ڕەشە.

مادەی خام: ماکی خاو؛ مـاکی سروشـتی کـە هێشتا هیچ کارێکی لە سەر نەکراوە.

مادەی مخـدر: مـاکی سـڕکەر؛ دەرمـان یـان ماکی وا کە دەبێتە هۆی سڕی، کاسی، نەشە، خەواڵـوویی، ژاراوی بـوون و پـاش ماوەیـەک چەشـتـەیی و هووکـارە بـوون (وەک تریـاک؛ مورفین، هێرۆئین و ...).

مادەی واحده: قانوونێ کە تەنیا یەک بەنـدی هەبێ.

▣ مادە کردن: ۱. چلک‌کردن؛ کێم‌کردن؛ هـەو کردن ۲. *[مجازی]* بن/ بێخ پەیدا کردن؛ قووڵ بوونـەوە؛ شـەڕ گەیشـتنە قـۆپی؛ هەڵـچوونی گێرە و کێشە.

**مــادەتــاریخ** / māddetārîx ، ـهـا/: [عربـی] *اسم*. هۆنراوە یان سارستەیێ کە مێـژووی ڕووداوێـک دەردەبڕێت (زۆرتر لەڕووی حیسابی ئەبجەدەوە).

**مــادەشناســی** / māddešenāsî/: [عربی/ فارسـی] ☜ **متالورژی**

**مــادەگرایــی** / māddegerāyî/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **ماتریالیسم**

**مادی**[1] / mādî/: *اسم*. مـادی؛ زمانێـک کـە لـە وڵاتی ماددا باو بووە و تـا ئێسـتاکە ئاسـەوارێکی سەربەخۆی لێ نەدۆزراوەتەوە.

**مادی**[2]: *صفت*. مادی: ۱. پێوەندیدار یان سەر بە ماد ‹زبان مادی: زمانی مادی› ۲. خەڵکی ماد.

**مادی** / māddî/: [عربی] *صفت*. مـاکی؛ مـاددی: ۱. سەر بە ماک ۲. لە ماک چێ‌کراو ‹جسم مادی: تەنی ماکی› ۳. بە بایەخی بازەرگانی یان پارەیی ‹کمـک مـادی: یارمــەتی مــاددی› ٤. *[کنـایی]* پووڵەکی؛ ماڵ خۆشەویست؛ دنیادۆست.

**مادیات** / māddîyyāt/: [عربی] *اسم*. ۱. کەل‌وپەل و کار و بـاری دنیـایی ۲. *[مجـازی]* مالـی دنیـا؛ ئەوەی دەگەڕێتەوە سەر ماڵ و دارایـی ‹پیش او مادیات بهایی ندارد: ماڵی دنیای لەلا پووشە›.

**مادیان** / mādiyān ، ـهـا/: *اسم*. مـایین؛ مـاهین؛ ماهینە؛ مەینە؛ ماهینی؛ مەهان؛ مهان؛ مـەهین؛ مەعین؛ ماین؛ چروە؛ ئەسپی پێگەیوی مێوینە.

**مــادیگری** / māddîgarî/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **ماتریالیسم**

**مادینــه** / mādîne ، ـهـا/: *اسـم*. مـێ؛ مێوینـە؛ مێچک؛ مێچکە؛ مۆن؛ ما؛ ئەمێ؛ مێـوە؛ مێنگـە؛ مێوەڵە؛ مان. بەرانبەر: **نرینه**

**مــار** / mār/: *اسـم*. مـار: ۱. *[نجـوم]* وێنەیـەکی گەردوونی: **حَیَّه** ۲. /ـهـا؛ ـان/ مـۆر؛ گیانـەوەری خزۆکی بێ‌دەست و پـێ بـە جەسـتەی درێـژی پووڵەکاویەوە، هێلکەکەرن و زۆربەیان ژەهرداڕن ۳. ناوی شەسەم ساڵ لە دوازدە ساڵی تەقویمی تورکستانی ☜ **تقویم**

▣ مار آب شیرین: ماری بێ‌گەزەنی ئاسایی کـە بۆق دەخوا.

مار آبی: ماراوی؛ ماری ئاوی؛ ماری ئاوژی.

مار اَرقَم ☜ **مار پیسه**

مار بُوآ ☜ **بُوآ**

مار پیسه: ماری بەڵەک/ خـاڵ بەڵـەک؛ مـاری ڕەشی خاڵ سپی: **مار اَرقَم**

مــار جعفـری: کــەوە مــار؛ جــۆرە مــارێکی ژەهرداری بۆر، زەرد یان قاوەیی، بە قـەپۆزی

پان، سەری باریک و سێسووچەوە کە بە لادا دەڕوا.

**مار خوش‌خط‌وخال**:*[کنایی]* سەر قۆزی بن ئاڵۆز؛ سەر دۆستی بن کۆست؛ لە بەر باجی، لە پشت قەیچی؛ خاوەنی دیمەنێکی جوان و دڵبزوێن بەڵام لە دڵەوە پیس و پۆخڵ.

**مار درختی**: ماری داری؛ مارێکی درێژی بۆر، زەرد، زەیتوونی یان ئاماڵ قاوەیی کە ددانە چزەکەی لە بن دەمیدایە.

**مار دریایی**: ماری زەریایی؛ گیانەوەری ئاوژی ژەهرن بە درێژی زیاتر لە میترێک کە لە ئاوی گەرمی دەریادا دەژی.

**مار زنگی** ☜ **کُبرا**

**مار عینکی** ☜ **کُبرا**

**مار کُبرا** ☜ **کُبرا**

**مارهای حلقوی**: ماری پەلکەیی؛ ڕەگەزێ مار بە سەری بچووک، پوولەکەی ورد و نەرم و ڕنگاوڕەنگەوە: **مارهای زرفینی**

**مارهای زرفینی** ☜ **مارهای حلقوی**

**مارهای زنگوله‌دار**: ڕەگەزە مارێکی ژارداری زەرندە بە کلکی کوڵ و سەر و ملی قوتەوە کە لە پوولەکەکانی ئاخری کلکیەوە دەنگێکی وەک دەنگی زەنگۆڵە دێت.

**مارهای سمی**: ماری ژاردار؛ ماری ژەهرین؛ هەر کام لەو مارانە لە وشکی دەژین و چزیان ژاراویە.

**مارهای معمولی**: ماری ئاسایی؛ هەر کام لەو مارانەی بێچزن یان چزیان کەمژارە، نێر و مێیان لە یەک دەچێ، پوولەکەیان لووسە و لە هەر دوو هارووادا ددانیان هەیە.

▣ **مار خوردن و افعی/ اژدها شدن**:*[مجازی]* فێرە کەڵەک و فێڵەوازی بوون و باش ڕاهاتن بۆ فریو و تەڵەکە لە خەڵک.

**مار در آستین پروردن**:*[مجازی]* توولەگورگ هاوردنە ماڵ؛ لەگەڵ خزم یان کەسێکی خراپدا چاکی و پیاوەتی کردن.

**مار را با زبان از سوراخش بیرون کشیدن**: *[مجازی]* بە زمانی خۆش مار لە کونی دەرهێنان؛ زمان لە بەرپێ دان؛ بە قسەی خۆش و نەرمەنەرم، لاسار و سەربزێو هێنانە سەر ڕێ ‹تو با این زبانی که داری مار را از سوراخش بیرون می‌کشی: **ئەتۆ بەم** زمانە خۆشەت مار لە کونی دەردێنی›.

**مار را به دست کسی دیگر گرفتن**:*[کنایی]* بە باڵی کەسێکیتر فڕین؛ بە دەس کەسیتر مارگرتن؛ کاری پڕمەترسی بە کەسێکیتر کردن.

**مار زدن**: مار پێوەدان؛ مار گەستن؛ مار گەستەی ‹یک کارگر راه‌سازی را مار زده بود: کرێکارێکی ڕێسازی مار پێوەی دابوو›.

**از ترس مار به اژدها/ افعی پناه بردن**: لە ترسی ئاو خۆ دەئاگر هاویشتن؛ لە ترس مار پاڵ بە ئاگرەوە دان؛ بۆ خۆ پاراستن لە خراپ، خۆ تووشی خراپتر کردن.

**مارافسای** / mār'afsāy/:*اسم.* مارگیر؛ مارگر: ١. *[ها]/[ادبی]* کەسێ کە مار دەگرێ ٢.*[نجوم]* کەلوویەکی گەورە لە ئاسمانی نیوەگۆی باشووردا: **حوا**

**مارپیچ**[1] / mārpîč ، ـها/:*اسم.* پێچ ـ پێچ؛ مارپێچ؛ قەمچ و پێچ؛ کەوانەیێ کە بەردەوام لە ناوەندی، دوور و نزیک دەکەوێتەوە.

**مارپیچ**[2]: *صفت.* پێچ ـ پێچ؛ مارپێچ؛ قەمچ و پێچ؛ قەنچ و پێچ؛ قەنچاوپێچ؛ پێچەڵپێچ؛ بە بیچم، ڕێ یان شێوە ڕۆشتنێ کە بەردەوام سووڕ بخواتەوە.

**مارپیچی** / mārpîčî/: *صفت.* مارپێچ؛ پێچاوپێچ؛ قەمچ و پێچ.

**مارچ** / mārč/: [انگلیسی] ☜ **مارس**

**مارچوبه** / mārčûbe ، ـها/:*اسم.* مارچێوە؛ گیاماران؛ مارچۆوە؛ چاومارە؛ شەفەلە؛ کەبەر؛

ترچک؛ گیاگوڵەنگ؛ گیایەکی پایای لق و پۆ دەرزی، بە گەڵای پووڵەکەیی و گوڵی سپی یان سەوز و بەری سوورەوە کە ساقەتەکەی دەخورێ، چەند جۆرێکیشی جوانە و بۆ رازاندنەوە دەشێ.

**مارس** / mārs/:/اسم. مارس: ۱. [فرانسوی] مارچ؛ مارت؛ ئازار؛ ئادار؛ مانگی سێهەم لە ساڵی زایینی بە ۳۱ رۆژەوە کە لە دەی رەشەمەوە دەس پێدەکا: **مارچ** ۲. [ترکی] دۆڕانێکی دوو بەرامبەر لە کایەی تەختەدا بە هۆی ئەگەر لایەنێ هەموو مۆرەکانی هەڵگرتبێ و ئەوی دی هیچی هەڵنەگرتبێ ‹این دست هم مارس شدی: ئەم دەستیشە مارس بووی›.

**مارش** / mārš/: [فرانسوی]/اسم. مارش؛ ئاهەنگی مووسیقای دوو یان چوار زەربی بۆ رێک و تەکووزکردنی هەنگاوانی هێزی چەکداری لە رێژە و ورووژاندیان لە شەڕگەدا.

▣ **مارش عزا**: مارشی ئازیەت؛ مارشی زۆر هێواش و نەرم بۆ ئازیەتباری.

**مارشال** / māršāl ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. مارشاڵ؛ ئەفسەری ئەرشەد بە پلەکی چەکداری بەرانبەر بە سپەهبود.

**مارک** / mārk ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. مارک: ۱. وێنە یا نیشانەی تایبەتی دامەزراوەیێ کە لە سەر شتێک چاپ کراوە، هەڵکەنراوە یان پێوەنراوە ۲. یەکەی پارەی ئاڵمان پێش یورۆ.

**مارکسیزم** / mārksîzm/: [فرانسوی] ☜ **مارکسیسم**

**مارکسیست** / mārksîst ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی]/اسم. مارکسیست: ۱. شوێنکەوتوو یان لایەنگری مارکسیسم ۲. مارکسیستی.

**مارکسیستی** / mārksîstî/: [فرانسوی] صفت. مارکسیستی؛ پێوەندیدار یان سەر بە مارکسیست.

**مارکسیسم** / mārksîsm/: [فرانسوی]/اسم. مارکسیسم؛ ئامۆژەی فەلسەفی ـ ڕامیاری کارل مارکس (۱۸۱۸ـ۱۸۸۳ زایینی) فەیلسووفی بەناوبانگی ئەڵمانی، لە سەر بنەمای ماتریالیسم و سوسیالیزم: **مارکسیزم**

**مارکسیسم ـ لنینیسم** / mārksîsmlenînîsm/: [فرانسوی]/اسم. مارکسیسم ـ لینینیسم؛ ئامۆژەی شۆڕەوی پێشوو، بەرهەمی لێکدانەوە و بۆچوونی لینین (۱۸۷۰-۱۹۲٤ زایینی) لە مارکسیسم. هەروەها: **مارکسیست ـ لنینیست**

**مارکی** / mārkî ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. مارکی؛ نازناوی ئەشرافی میراتی بۆ پیاوان لە برێ وڵاتانی ئورووپاییدا.

**مارکیز** / mākîz ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. مارکیز؛ نازناوی ئەشرافی میراتی بۆ ژنان لە برێ وڵاتانی ئورووپادا بۆ ژن یان بێوەژنی مارکی.

**مارگارین** / mārgārîn/: [فرانسوی]/اسم. مارگارین؛ جۆرێ کەرەی دەسکرد لە رۆنی پاڵفتەی گیا، شیر، ئاو و ماکیتر (وەک زەردێنەی هێلکە، کازئین، ویتامین، ماکی رەنگی).

**مارگزیدگی** / mārgazîdegî/: /اسم. مارانگازی؛ مارگەستەیی؛ مارانگەستەیی: ۱. مارپێوەداوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی مار پێوەدان ۲. ئەو شوێنە مار گەستوویەتی.

**مارگزیده**[1] / mārgazîde ، ـها؛ ـگان/: صفت. مارانگاز؛ مارانگەز؛ مارانگەستە؛ مارگەستە؛ مارگەستی؛ مارزەیە؛ ماردریای؛ مار پێوەداو ‹مارگزیده از ریسمان سیاه و سفید می‌ترسد: مارانگاز لە گوریس دەترسێ›.

**مارگزیده**[2]: صفت. مازانگەز؛ مارگەستە؛ تووشیاری مارگەستوویی.

**مارگیر** / mārgîr ، ـها؛ ـان/:/اسم. مارگیر؛ مارگر: ۱. ئەوەی خەریکی ڕاوەمارە ۲. مارباز؛ کەسێ کە بۆ سەر قاڵی خەڵک ماران دێنێتە سەما و گەمەیان لەگەڵ دەکا.

**مارمالاد** / mārmālād/: [فرانسوی از پرتغالی]/اسم.

مارمالاد؛ جۆرێک مرەبای چەرخکراوی خەست و خۆڵ لە میوەی ئاودار.

**مارماهی** / mārmāhî ، ـها؛ ـان/:/سم. ماراقی؛ مارماسی؛ مارماسە؛ مارماساو؛ جۆرێ ماسی کە لە مار دەکا بەڵام چزی نیە و گۆشتی دەخورێ.

**مارماهی آب شیرین:** جۆرێک مارماسی کە لە ئاوی شیریندا گەورە دەبێ و پاش گووران ڕوو دەکاتە دەریا.

**مارماهی برقی:** جۆرێک ماسی گەورە کە بە کارەبای لەشی خۆی ماسیەکانیتر سڕ دەکا و دەیانگرێ.

**مارمولک** / mārmûlak ، ـها؛ ـان/: [از کردی]/سم. مارمێلکە؛ مارمێلک؛ مارملووک؛ مارملیک؛ مارمیلۆک؛ مارمیلک؛ مارمارۆک؛ مارمزووک؛ مارمەزووکە؛ مەزووکە؛ مارمەزووکی؛ مەزووکلێ؛ مزرک؛ مارژۆک؛ مارمارۆشک؛ ماماریشۆک؛ مەرمەشۆک؛ ماریلە؛ ماریاکە؛ بیکمار؛ بۆکمار؛ مارگێس؛ مارندوگ؛ خلنزەر؛ خلنەزەر؛ شینشینەک؛ شینشینک؛ لووسلووسەک؛ خەج خەجۆک؛ شەوگەرد؛ لەهلاک؛ گیانەوەرێکی خزۆکی پوولەکەدارە، جۆری بێدەست و پایان لە مار دەکا و هەموو جۆریکیان دەتوانن لە هەلاتندا کلکیان داخەن و سەر لە نوێ کلک دەربێننەوە: **کربشە؛ کرفش** *[قدیمی]*

**مارونی** / mārûnî/: [؟]/سم. ماروونی: ١. لقێ لە مەسیحیانی عەرەبی کاتۆلیک، شوێنکەوتووی ماروونی پیرۆز (نزیک بە ٤١٠ زایینی) کە ناوەندیان لوبنانە ٢. /ـها؛ ـان/ هەر کام لە مەسیحیانی شوێنکەوتووی ئەو لقە.

**ماریجوانا** / mārîcuvānā/: [انگلیسی از اسپانیایی]/سم. ماریجوانا؛ وشکەوەکراوی گەڵا و سەر لقوپۆی گیای شادانە کە لە بەر سڕکەر بوونی وەکوو جگەرە دەیکێشن.

**ماز** / māz/: [انگلیسی]/سم. ١. تۆڕێ لە دالانگەلی پێچاوپێچ کە ڕێ لێ دەرکردنی سەختە ٢. هەر پێکهاتەیەک وا دروست کرابێ.

**مازاد** / māzād/: [عربی] *صفت*. زیاد؛ زیادە؛ زۆرتر لە ڕادەی دڵخواز یا پێوست ‹مازاد بر نیاز: زیادە لە پێویست›.

**مازو** / māzû/: [کردی]/سم. دارمازوو؛ مازی؛ مازک؛ مازێر؛ دارمازگ: ١. /ـها/ مازوار؛ درەختێک بە کڵاوەی گردی گەورە، گەڵای تووکنی هێلکەیی و بەری پیاڵەئاسای درێژ و سپیەوە ٢. دەقلووک؛ جەوی سەر گەڵا و لق و پۆی دارمازگ کە بە هۆی چز پێوەدانی مێروو دەری دەکا.

**مازوت** / māzût/: [فرانسوی از روسی از عربی]/سم. نەفتەڕەشە؛ مازووت؛ نەوتی ڕەش؛ بەرهەمی دڵۆپاندنی نەوتی خاو یا پلاشەبەرد، کە بۆ سووتەمەنی، لە برێ موتوری دیزلی و کوورەی نەوت سووتدا بەکار دەچێ.

**مازوج** / māzûc/: [کردی]/سم. مازوو؛ مازووج؛ مازگ؛ مازی؛ گولێر؛ بەری دارمازوو.

**مازوخیست** / māzoxîst ، ـها/: [فرانسوی] *صفت*. *[روان‌شناسی]* مازوخیست؛ ئازارخواز؛ تووشی نەخۆشی مازوخیسم.

**مازوخیستی** / māzoxîstî/: [فرانسوی] *صفت*. مازوخیستی؛ ئازارخوازانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە مازوخیسم.

**مازوخیسم** / māzoxîsm/: [فرانسوی]/سم. *[روان‌شناسی]* مازوخیسم؛ ئازارخوازی؛ جۆرێک ئاڵۆزاوی دەروونی کە نەخۆش بە ئازاردران و سووکایەتی پێکران لە لایەن گراویەوە کاژێر دەبێ و دادەمرکێ.

**مازه** / māze/: [کردی] ☜ تناب پشتی، **تناب**

**ماژور** / mājûr ، ـها/: [فرانسوی]/سم. *[نامتداول]* مەیجر؛ سەرگورد.

**ماژیک** / mājîk ، ـها/: [فرانسوی]/سم. ماژیک؛ ناوی بازرگانی جۆرێک پێنووس بە مەرەکەفدان و نووکی لبادەوە (بۆ مژین و دەردانی مەرەکەف)

کە زۆرتر بۆ نووسین بە خەتی گەورە و نیگارکێشان دەبێ.

**ماساژ** / māsāj/: [فرانسوی]/*اسم*. لەپماڵ؛ کەڤماڵ؛ وەرژۆ؛ پەرخ؛ ماساژ؛ کار و ڕەوتی شێلان؛ ولین؛ بلین؛ ڤەمالین؛ مالینی ماسوولکە بە دەست یان هەر کەرستەیەکی‌تر بۆ دەرمان و لەش‌ساخی ‹پایم ضرب دیده بود ماساژ دادم کمی بهتر شد: پام کوترابوو لەپمالم کرد تۆزێ باشتر بوو›. هەروەها: **ماساژ دادن**

**ماساژور** / māsājor، ـها/: [فرانسوی]/*اسم*. وەرژۆدەر؛ مالشتدەر؛ ئەوەی کاری شێلان بێت.

**ماساندن** / māsāndan/: *مصدر متعدی*. // **ماساندی**: گرساندت؛ **می‌ماسانی**: دەگرسێنی؛ **بماسان**: بگرسێنە// ۱. گرساندن؛ مەیاندن؛ کەسداندن؛ گوڤهاندن؛ گرسنەی؛ گرسنای؛ زەمتاندن؛ ڕچاندن ۲. *[مجازی]* ڕۆن لە نانی کەسێک هەڵسوون؛ خەیر بە کەسێ گەیاندن ‹ببین می‌توانی چیزی به ما بماسانی؟: بزانە دەتوانی رونیک لە نانی ئیمە هەڵسووی؟› ۳. *[مجازی]* گوڤتاندن؛ پێک‌هێنان؛ جۆش دان. هەروەها: **ماساندنی**

■ **صفت مفعولی**: **ماسانده** (گرسێنراو)

**ماسبق** / māsabaq/: [عربی]/*اسم*. رابردوو؛ ڕابووردوو؛ ویەردە؛ پێشوو؛ ئەوەی لە پێشتردا بووە یان کراوە ‹قانون عطف به ماسبق نمی‌شود: قانوون بۆ رابردوو هەڵناگەڕێتەوە›.

**ماست** / māst/: *اسم*. ماست؛ ماس؛ مێست؛ مۆست؛ ترۆلە؛ ترۆلە؛ شیری هەوێن‌کراو و گرساو کە خواردنێکی هەموانیە.

▣ **ماست چکیده**/ کیسه: تۆراخ؛ تۆراغ؛ دۆس‌وێر؛ ماستی ئاو لێ‌چنراوی خەست‌کراو.

▣ **ماست به دهن کسی بودن**: *[تعریض]* قورقوشم لە گەرووی کەسێکدا بوون؛ قاوت لە دەم کەسێکا بوون؛ لە کاتی پێویستدا هیچ نەگوتن ‹حرفی می‌زدی، اعتراضی می‌کردی، مگر ماست به دهنت بود؟!: قسەیەکەت دەکرد، دەنگێکت هەڵدەهێنا، مەگەر قورقوشمت لە گەروودا بوو؟!›.

**ماست را هم نبریدن**: *[تعریض]* ماستیش نەبڕین؛ زۆر کول بوون (بۆ چەقۆ و مەقەست و... دەگوترێ) ‹این چاقو که ماست را هم نمی‌برد: ئەم چەقۆیە خۆ ماستیش نابڕێ›.

**ماستها را کیسه کردن**: *[مجازی]* واز هێنان؛ کۆتا کردن؛ ترسان و دەست بەردان ‹تا سر و کلّه‌ی پاسبان‌ها پیدا شد، آزاد ماست‌ها را کیسه کرد و دست از فحاشی و عربده‌کشی برداشت: هەر پاسبانەکان دەرکەوتن، ئازاد وازی هێنا و دەستی لە جنێو دان و قیڕاندن هەڵگرت›.

**ماست‌بند** / māstband، ـها/: *اسم*. ئەوەی ماست هەوێن دەکا؛ کەسێ کە ماس ئەنێ.

**ماست‌بندی** / māstbandî/: *اسم*. ۱. کار و ڕەوتی گوڤهاندن؛ مەیاندن؛ نیان؛ هەوێن‌کردن؛ ئامیان‌کردنی شیر بۆ ماست یا پەنێر ۲. ـها/ کارگەی بەرهەم هێنانی داهاتگەلی شیر.

**ماستمالی** / māstmālî/: *اسم*. *[کنایی]* ماسمالی: ۱. ڕەوتی بە ڕواڵەت سەر و بنی کار هێنانە یەک ‹اگر بخواهی کارها را سرهم‌بندی و ماستمالی کنی معامله‌مان نمی‌شود: ئەگەر بتهەوێ کارەکان تەتەپەخێ و ماسمالی بکەی، پێکەوە نامانکرێ› ۲. کار و ڕەوتی پینەکردن؛ پا پێدا ساوین؛ ڤەکروپاندن؛ داپۆشینی هەڵە و عەیب ‹قرار بود برود دادگاه، اما قضیه را ماستمالی کردند و به زور رضایت گرفتند: بڕیار بوو بڕوا بۆ دادگا، بەلام ماسمالیان کرد و بە زۆر ڕەزایەتیان سەند›.

**ماستی**[1] / māstî/: *اسم*. *[گفتاری]* ۱. ماست‌فرۆش؛ ماس‌وەرش؛ کەسێک کە ماست دەفرۆشێ ۲. ماستکەر؛ ئەوەی ماست هەوێن دەکا.

**ماستی**[2]: *صفت*. ماستی؛ ماسی: ۱. بە ماست؛ تێکەلاو بە ماست ۲. ماستاوی؛ ماست پێوەتلاو؛ لە ماست گەوزاو.

**ماستیک** / māstîk/: [انگلیسی]/اسم. ماستیک: ۱. شیلەی داری مەستەکی کە دەنکێکی خڕی زەردە بە تام و بۆنی ئارامەوە، لە ئەلکول و ترەبانتینندا دەتوێتەوە و لە ددان‌سازی و نیگارکێشیدا بە کەڵک دێ ۲. هەویرێکی خەستی تایبەتی گرتنی درزی پەنجەرە و بەنکەشی و... بۆ بەرگری لە نم.

**ماسک** / māsk ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. دەمامک؛ ماسک؛ ماسکە: ۱. ڕووبەند؛ پەچە؛ پێچە؛ پووشی؛ ڕووبەنە ۲. ئەوەی کۆستە، ڕووی پێ‌دەگرێ و خۆی پێ‌دەگۆڕێت ۳. ئەوەی دەم و لووتی پێ‌دەگرن تا کۆئەندامی هەناسەدان بپارێزێت ٤. کەرستەیێ کە کاتی کارکردن، دەم و چاو لە گەزن دەپارێزێ.

▣ **ماسک گاز**: ماسکی گاز؛ ماسکێک بۆ پالاوتنی هەوا و بەرگری لە وەزەنی گازی ژاراوی بۆ پێستی دەم و چاو و کۆئەندامی هەناسەدان.

▣ **ماسک از چهره‌ی کسی برداشتن** ☜ نقاب/ ماسک کسی را دریدن، **نقاب**

**ماسک کسی را دریدن** ☜ نقاب/ ماسک کسی را دریدن، **نقاب**

**ماس‌ماسک** / māsmāsak ، ـها/: اسم. *[گفتاری]* ئەسپاوبازی؛ ئامێری بێ‌کەڵک و بێ‌بایەخ.

**ماسوره** / māsûre ، ـها/: اسم. ماسۆڵە؛ ماسوولکە؛ بلبلیشک؛ ماسوولە؛ ماسوور: ۱. کەرستەیەکە جۆلا بۆ تەنین، داوی لێ‌دەپێچن ۲. قرقرەیەکی بچووک دە ژێر چەرخی دروومان بۆ دەزوو تێوەپێچان ۳. خەرەکی نێو گوللەی تۆپ و خومپارە کە ناهێڵێ گوللە پێش لە پێکان بتەقێتەوە.

**ماسه** / māse ، ـها/: اسم. *[زمین‌شناسی]* ماسە؛ کفت؛ کتلە؛ هوس؛ هۆسە؛ زیخ؛ خیز؛ قم؛ چەوی ورد؛ دەنکی وردی لاواری لە کوارتز و وردەبەرد لە ئەندازەی ۱ تا ۲ میلی‌میتردا.

**ماسه‌سنگ** / māsesang/: اسم. گەلال؛ زیپکەبەرد؛ ڕەشەبەرد؛ بەردێ کە لە خیز گەورەترە.

**ماسه‌شویی** / māsešûyî/: اسم. ماسەشۆری؛ کار و ڕەوتی شۆردنەوەی خیز بو ئەوەی قوڕی پێوە نەمێنێ.

**ماسیدن** / māsidan/: *مصدر. لازم.* ۱. مەیین؛ گرسان؛ گرسیان؛ بەستن؛ کەسدین؛ گوڤین؛ گڤین؛ ڤەرسین؛ گرسەی؛ گرسای؛ زەمتین؛ قەرسین؛ قەرسان؛ ڕەق هەلاتن؛ وشک هەلاتن ‹خون روی دیوار ماسیده بود: خوێن بە دیوارەکەوە مەیبوو› ۲. *[مجازی]* پێ‌گەیشتن؛ بەهرە بردن ‹بگو ببینم از این معامله چیزی به من می‌ماسد؟: بێژە بزانم لەم سەودایە شتێکم پێ دەگا؟›. هەروەها: **ماسیدنی**

■ صفت مفعولی: **ماسیده** (مەیبو)/ مصدر منفی: **نَماسیدن** (نەمەیین)

**ماش** / māš ، ـها/: اسم. ماش؛ ماشە؛ شۆلک: ۱. گیایەکی یەک‌سالانە، بە لاسکی ناسک و درێژ، گەلای لاولای، گولی ئەرخەوانی و سپی و بەری باریک و درێژ و تیسکنەوە کە پاش گەیشتن، بۆر هەڵدەگەڕێ ۲. دەنکی خڕ و وردی ئەو گیایە کە لە تاقمی دانەوێڵەیە.

**ماشاءالله** / māšā'allāh, māšāllāh/: [عربی] *دعا.* ماشەڵلا؛ لە چاوی پیس بە دوور بێ (تێبینی: واتای وشەبەوشەی دەبێتە: «هەرچی خودا بیەوێ» بەلام پتر بۆ پەسەن دانی کەسێک بە کار دێ) ‹ماشاءالله بزرگ شده است!: ماشەڵلا گەورە بووە!›.

**ماشرا** / māšarā/: [سریانی]/اسم. *[پزشکی، قدیمی]* دۆخی پەنەمانی دەم و چاو.

**ماشک** / māšak/: اسم. زیزانە؛ زیزان؛ مژیوەرد؛ میژوەرد؛ میژوەردی؛ گیایێکی دەشتەکی بە دەنکێکی خڕ و ورد و زۆر ڕەقەوە کە لە ناو نیسک و نۆک و دەغڵ و داندا دەڕوێ.

**ماشوره** / māšûre/ ☜ ساقه ماشورەای، **ساقه**

**ماشه** / māše ، ـها/: [از عربی: مِحَشّە]/اسم. ماشە؛

ماشەک؛ پێ؛ پەلەپیتکە؛ قولاب‌ئاسایەک لە برێ دەزگادا کە ئەگەر بکێشرێ دەزگاکە دەکەوێتە کار.

**ماشی**[1] / mâšî/:/اسم. ماشی؛ کەسکی تۆخ؛ ڕەنگی ماش.

**ماشی**[2]: صفت. ماشی‌ڕەنگ؛ بە ڕەنگی کەسکی تۆخ. هەروەها: **ماشی‌ڕنگ**

**ماشین** / mâšîn ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ماشین: ١. دەزگا؛ ماکینە؛ مەکینە؛ ئامێرێک لە چەن بەش کە بۆ ڕاگوێزان و گۆڕانی هێز، تەوژم و جوولە دروست‌کراوە ٢. /ـآلات/ هەر ئامرازێکی کارەبایی، میکانیکی یان ئیلکترونیکی بۆ جێبەجێ کردنی کارێک ٣. ماشێن؛ سەیارە؛ گەڕۆک؛ ئوتومبیل؛ ترومبیل ٤. هەر ئامێرێ کە مرۆڤ دروستی بکا ٥. ئامێرێک بۆ کورت‌کردنەوەی مووی سەر و ڕیش.

▣ **ماشین پلی کپی**: پولی کۆپی؛ دەزگایەکی دەستی یان کارەبایی کە نووسراوەی سەر کاغەزی مۆمی دەگرێتەوە و لە سەر کاغەزی ئاسایی تۆماری دەکا.

**ماشین تحریر** ☜ **ماشین‌تحریر**

**ماشین دوخت**: مەنگەنە؛ ئامێرێکی دەستی بۆ پێکەوە لکاندنی دوو یان چەند پەڕە کاغەز بە تەل.

**ماشین دودی** ☜ **ماشین‌دودی**

**ماشین ظرفشویی**: ماشینی دەفرشۆر؛ دەزگایەکی خۆمەش بۆ شۆردنی دەفر و قاپ و قاچاغ.

**ماشین لباسشویی**: ماشینی جلشۆر؛ دەزگایەکی خۆمەش کە جل و بەرگ دەشۆرێ.

▣ **ماشین کردن**: ماشین کردن: ١. تاشین؛ بە ماشین موو لابردن یان کورت کردنەوە ‹بردند سرش را ماشین کردند: بردیان سەریان تاشی› ٢. تایپ کردن؛ نووسینی شتێک بە ماشینی تایپ ‹**نامه را** ماشین کرد: **نامەکەی** تایپ کرد›.

**ماشین آلات** / mâšînâlât/: [فرانسوی/ عربی] جمعِ ☜ **ماشین**

**ماشین‌ابزار** / mâšîn'abzâr/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. ئامێری تاشین و کڕاندنی کانزا و بە بیچم و شێوەی دڵخواز دەرهێنانی.

**ماشین‌تحریر** / mâšîntahrîr ، ـها/: [فرانسوی/ عربی]/اسم. ماشین‌تایپ؛ دەزگای نووسین لە سەر کاغەز.

**ماشینچی** / mâšînčî ، ـها/: [فرانسوی/ ترکی]/اسم. ماشینچی؛ ئەوەی بە ماکینەیەکی پیشەسازی کار دەکا.

**ماشینخانه** / mâšînxâne ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. ماکینەخانە؛ ماشینخانە؛ شوێنێک لە ڕێکخراوەیەکی پیشەسازیدا کە ماکینەکانی تێدا دامەزراوە.

**ماشین‌دودی** / mâšîndûdî/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. *[قدیمی]* شەمەندەفەر؛ قەتار.

**ماشین‌رو** / mâšînrow/: [فرانسوی/ فارسی] *صفت.* ماشین‌ڕۆ؛ لەبار بۆ پێدا ڕۆشتنی ماشین.

**ماشین‌سازی**/ mâšînsâzî/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. ماشین‌سازی: ١. کار و ڕەوتی سازکردنی ماشین ٢. /ـها/ کارخانە یان کارگەی دروست کردنی ماشین.

**ماشین‌شو** / mâšînšû ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. ماشین‌شۆر؛ کەسێ یان ئامرازێک کە ماشین دەشوا: **ماشین‌شور** *[گفتاری]*

**ماشین شور** / mâšînšûr/: [فرانسوی/ فارسی] ☜ **ماشین‌شو**

**ماشین‌شویی** / mâšînšûyî/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. ١. ☜ **کارواش** ٢. کار و ڕەوتی شۆردنی ماشین.

**ماشین‌نویس** / mâšîn.nevîs ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. ماشین‌نووس؛ کەسێ کە (بەتایبەت لە ڕێخراوە و نووسینگەدا) نامە و نووسراوە بە ماشین‌تایپ دەنووسێتەوە.

**ماشـین‌نویسـی** / māšîn.nevîsî/: [فرانسـوی/ فارسـی]/سـم. ماشـین‌نووسـی: ۱. کـاری ماشین‌نووس ۲. کار و ڕەوتی نووسینی بابەتێک بە ماشین.

**ماشین وار** / māšînvār/: [فرانسوی/ فارسی] قید. وەک ماشین؛ مەکینەئاسا؛ ماشین‌ئاسا؛ وەک مەکینـە؛ بـە شـێوازی ماشـینی ‹ماشین‌وار کار می‌کردند: وەک ماشین کاریان دەکرد›.

**ماشـینی** / māšînî/: [فرانسوی] صفت. ماشـینی: ۱. بەرهـەمی ماشـین ‹فـرش ماشـینی: فەرشـی ماشینی› ۲. وەک ماشین ‹رفتار ماشینی: کردەوەی ماشینی›.

**ماضـی** / māzî/: [عربی]/سم. [دستور] ڕابـردوو؛ کاتی ڕابـرد؛ زوونـە؛ کـاتی بـەر لـە ئێسـتا یـان ڕووداوێ کە قسەی لێ‌دەکرێ.

◙ **ماضی استمراری:** ڕابـردووی بـەردەوام؛ ئـەو کارە لە ڕابردوودا بۆ ماوەیەک بـەردەوام بـووە یان دووپاتە بۆتەوە (وەک: می‌گفتم؛ مـی‌رفتنـد: دەمگوت؛ دەچوون).

**ماضی التزامی:** ئەو کارە لە ڕابردوودا کە دەلـوا یان دەیانویست بیکەن (وەک: شاید آرام آنجـا را دیده باشد: ڕەنگە ئارام ئەوێی دیتبێ).

**ماضی بعید:** ڕابردووی تـەواو؛ ڕابـردووی دوور؛ کارێ کە لە ڕابـردوودا ڕوویـداوە و پـێش لـە کارێکی‌تر کۆتـایی هـاتووە (وەک: تـا بـە آنجـا رسیدم آزاد رفتـه بـود: تـا گەیشـتمە ئـەوێ، ئـازاد ڕۆیشتبوو).

**ماضی مطلق:** ڕابردووی سادە/ ساکار؛ کـردارێ کە لە ڕابردوودا ڕوویدابێ (وەک: آرام آمد: ئـارام هات).

**ماضی نقلی:** ڕابردووی گێڕاوە؛ کردارێ کە لـە ڕابردوودا دەسـتی پـێ‌کـردووە و درێـژە یـان شوێنەواری تا ئێستا ماوەتەوە (وەک: این نوشته را آزاد نوشـته اسـت: ئـەم نووسـراوە ئـازاد نووسیویەتی).

**ماغ** / māq/: صوت. بۆڕە؛ قۆڕە؛ بـۆڕەبـۆڕ؛ گـابۆڕ؛ دەنگی گا.

◙ مـاغ کشـیدن: بۆڕانـدن؛ بۆڕنـەی؛ بۆڕنـای؛ قۆڕاندن ‹صدای صاحبش را که شنید مـاغ کشـید: هەر کە دەنگی خاوەنەکەی بیست بوڕاندی›.

**مافـات** / māfāt/: [عربـی]/سـم. خەسـار؛ لەکیس‌چووگ؛ بـابردوو؛ فـەوتاو؛ نـەماو ‹جبران مافات دشوار است: قەرەوی خەسار گرانە›.

**مافنگی** / māfangî/ ☜ **مُفَنگی**

**مافوق** / māfowq, māfo:q، ـها/: [عربی]/سم. بالادەست؛ بانتر ‹از دستور مافوق سرپیچی مـی‌کنـد: مل بە فەرمانی بالادەست نادا›.

**مافوق** / māfowqe, māfo:qe/: [عربی] حرف. لـە سەرووی؛ سەرتر لە؛ بانتر لـە؛ سـەرووی؛ ژووری ‹مافوق تصور: لە سەرووی خەیال›.

◙ **مافوق صوت:** سەرووی دەنگ؛ ژووری دەنگ؛ بە فریکانسێ زۆرتر لە سنووری بیستنی گوێی مرۆڤ.

**مافیـا** / māfiyā/: [ایتالیـایی]/سـم. مافیـا؛ هـەر ڕێخراوەیەکی تیروریستی شاراوە (بۆ یەکەم جار لە سـەرەتاکانی چـەرخی نۆزدەهـەم لـە دوورگـەی سیسیلدا پێکهات).

**مـافی‌الضـمیر** / māfizzamîr, māfezzamîr/: [عربی]/سم. دڵ و دەروون؛ ئەو بابەتەی مرۆڤ لە ناخی بیریدا دەیهێنـێ و دەیبـا (بـریتی لـە بـیر، خـەیاڵ، مەبەسـت و...) ‹نمـی‌خواسـت کسـی از مافی‌الضمیرش آگاه شود: نەیدەویست کەس بـە دڵ و دەروونـی بزانێ›.

**ماقبل** / māqabl/: [عربـی] صفت. پێشتر؛ پێشووتر ‹این بدهی مربوط به سال ۶۰ و ماقبـل آن است: ئـەم قەرزە دەگەڕێتەوە بۆساڵی ۶۰ و پێشتر›.

**ماکارونی** / mākāronî/: [ایتالیایی/ فرانسوی]/سم. ماکارونی؛ مەقەڕنـە: ۱. جـۆرێ هەرشـتەی لـە ئاردی گەنم بۆ چێشـتێکی ئیتالیـایی بـە نـاوی سـپاگێتی ۲. چێشـتی سـپاگێتی کـە لـە

دەمکێشانی ئەو هەڕشتانە ساز دەبێت.

**ماکارونی‌سازی** / mākāronîsāzî/: [ایتالیایی/ فرانسوی/ فارسی]/اسم. ماکارونی سازی: ١. کاری بەرهەمهێنانی ماکارونی ٢. /ـها/ کارگەی دروست‌کردنی مەقەڕنە.

**ماکت** / mākeṭ ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ماکیت؛ نموونەی بچووکتر لە ئەندازەی ئاسایی شتێ (وەک ماشین یا ماڵ) کە بە دەست دروست دەکرێ.

**ماکروویو** / mākroveyv/: [انگلیسی] ☜ **مایکروویو**

**ماکزیمم** / mākzîmom,māgzîmom/: [فرانسوی] /اسم. لای سەروو؛ ماکزیمۆم: ١. زۆرترین؛ لای‌فرە؛ لانی‌زۆر؛ زۆرترین ڕادە ٢. ماوەی زۆرترین گەشە ٣. بان‌ترین ئاستی ڕێ‌پێ‌دراو * **ماکزیموم**

**ماکزیموم** / mākzîmom/: [فرانسوی] ☜ **ماکزیمم**

**ماکسی** / māksî/: [فرانسوی]/اسم. ماکسی؛ جۆرێ کراس یان دامەنی درێژ: **ماکسی ژوپ**

**ماکسی‌ژوپ** / māksîjûp/: [فرانسوی] ☜ **ماکسی**

**ماکو** / mākû ، ـها/:/اسم. ماکۆ؛ ماکوو: ١. میلەیەک لە جۆلاییدا کە ماسوولەی لە سەرە ٢. میلەیەکە لە چەرخی درووماندا غەرغەرەی لە سەر دادەنرێ.

**مأکول** / ma'kûl/: [عربی] صفت. ١. خواردنی؛ شیاوی خواردن ٢. [مجازی] بەتام؛ خۆش‌چێژ.

**مأکولات** / ma'kûlāt/: [عربی]/اسم. خواردەمەنی؛ خۆراک؛ خۆراس ‹در آنجا بعضی مأکولات به فروش می‌رسد: دەوێ برێ خواردەمەنی دەفرۆشرێت›.

**ماکیان** / mākiyān ، ـها/:/اسم. مریشک؛ مامر؛ کەرگە؛ کەرگی؛ هەکە؛ قیقی؛ تاقمێ باڵندەی دەندووک‌کورت و ئەستووری پا بە قەوەتی چوارقامک (وەک بەقلە، تاوس، مریشکی ماڵی و کەو) کە زوو دەستەمۆ دەبن.

**ماکیاولیسم** / mākiyāvelîsm/: [فرانسوی]/اسم. ماکیاڤێلیسم؛ ڕێبازی سیاسی نیکولۆ ماکیاولی (١٤٦٩ـ ١٥٢٧ ز.) ڕۆشنبیری ئیتالیایی کە جەخت دەکاتە سەر ئەوەی کە مەبەست، ڕێگە و هۆ پاکانە دەکا، سیاسەت ئەخلاق ناناسێ و ڕێگا و هۆی دوور لە ئاکاریش بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی باش ڕەوایە.

**ماگما** / māgmā/: [فرانسوی/ انگلیسی] ☜ **تَفتال**

**ماگنت** / māgnet ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. مەگنیت: ١. دەزگایەک بۆ پرۆسکە لێدان لە موتوری بنزینیدا ٢. میگناتیس * **مَگنت**

**ماگنتیت** / māgnetît/: [فرانسوی]/اسم. ماگنتیت؛ ماکێکی ڕەشی کانی کە بۆ ئاسن لێ‌گرتن و زۆر کاری‌تر، لە پیشەسازیدا کەڵکی لێ دەگرن.

**ماگنولیا** / māgnol(i)yā ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ماگنولیا؛ دارێکی جوان بە گەڵای هێلکەیی و گوڵی نێر و مای گەورەی سپی، ئەرخەوانی، زەرد یان سووری بۆنخۆشەوە.

**ماڵ**[1] / māl ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. /اموال/ سامان؛ ماڵ؛ دارایی؛ ئەوەی دەکرێ هی کەسێ بێت ‹مال زیادی نداشت: سامانێکی وەهای نەبوو› ٢. ماڵات؛ ڕەشەوڵاخ؛ چوارپای باری (وەک هێسر و ئەسپ و کەر).

▣ **مال غیرمنقول**: مردە؛ مردەماڵ؛ ئەو بەشە لە ماڵ و دارایی کە ناگۆزرێتەوە (وەک زەوی و باخ).

**مال منقول**: زیندە؛ زیندەماڵ؛ ئەو بەشە لە ماڵ و دارایی کە ئەملا و لای پێ دەکرێ (وەک ماشین و فەرش).

▣ **مالی نبودن**: شتێ/ شتێکی وا نەبوون؛ زۆر بەنرخ و بەبایەخ نەبوونی شتێ ‹این فرش که خریدی مالی نیست: ئەم فەرشە کڕیوتە، شتێکی وا نیە›.

**ـ ماڵ**[2]: پیواژه. ـ ماڵ؛ ـ ڕاماڵ؛ بماڵ؛ ماڵەوە؛

ئەوەی دەسڕێتەوە ‹دستمال: دەسماڵ›.

**مال** / māle/: [از عربی] *حرف.* هی؛ ئی؛ هین؛ هینوو؛ یا: ١. هی کەسێ یان شتێک ‹آن بچه مال شماست؟: ئەو منداڵە هی ئێوەیە؟› ٢. *[گفتاری]* بۆ؛ ماڵ؛ تایبەت؛ شیاو بۆ کارێک یان بەهرەیەکی تایبەت ‹این لباس مال زمستان است: ئەو جلە بۆ زستانە› ٣. سەر بە کەس، شت یان سەردەمێکەوە ‹این حرف مال چند سال پیش است: ئەم قسە هی چەن ساڵ لەمەو پێشە›.

**مالاریا** / mālār(i)yā ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* مالاریا؛ نۆگە؛ ڕۆژنارۆژە؛ نۆبەتێ؛ پەتایەکی گەرمەسێران کە لە چزی مێشوولەی هۆدرە (ئانۆفێل) بەدی دێ و نەخۆش تووشی یاو و لەرز و عارەقی تاوتاوە دەکا.

**مالاکیت** / mālākît/: [؟] ☜ **دَهنه**

**مالاگاسی** / mālāgāsî/: *اسم.* مالاگاسی: ١. ـ/ـها/ خەڵکی نیشتەجێی ماداگاسکار، بریتی لە دەوری ٥٠ هۆز ٢. زمانی ئەو خەڵکە.

**مال‌الاجاره** / mālol'ecāre ، ـها/: [عربی] *اسم.* کرێ؛ کرها؛ کراها؛ کرێماڵ؛ پارەیەک کە مالگر بە خاوەن‌ماڵی دەدا.

**مال‌التجاره** / mālottecāre ، ـها/: [عربی] *اسم.* کالای بازرگانی.

**مالامال** / mālāmāl/: *صفت.* پڕاوپڕ؛ دارماڵ؛ لیف؛ دەرگاخن؛ کەیل؛ پڕ؛ پەڕ؛ پڕبەپڕ؛ زپ؛ تژە؛ تەژی؛ نژن؛ ئارەیی؛ دارگتوو؛ زوفت؛ زەبەزەب؛ نقانق؛ پڕی وا کە هیچی‌تر نەگرێ ‹خیابان‌ها مالامال جمعیت بود: شەقامەکان پڕاوپڕ جەماوەر بوو›.

**مالاندن** / mālāndan/: *مصدر. متعدی.* // **مالاندی:** شێلات؛ **می‌مالانی:** دەشێلی؛ **بمالان:** بشێلە// ١. شێلان؛ ماڵین؛ ماڵتەی؛ ماڵەی؛ ماڵای؛ شێلاندن؛ شێلەی؛ شێلای؛ شێلتەی؛ داماڵان؛ داماڵین ‹کمی بمالان خوب می‌شود: نەختێ بیشێلە چاک دەبێتەوە› ٢. *[مجازی]* شێلان؛ شێلاندن؛ شێلانن؛ تاشاندن؛ لێدان؛ داپلۆساندن؛ پلۆسانیرە؛ شاخ شکاندن؛ ڕۆپەلۆسین؛ چاک‌چاک تەمێ کردن ‹او را حسابی مالاند: چینێکی باشی شێلا› ٣. هەڵوەشاندن؛ هەڵشێواندن؛ بەتاڵ‌کردنەوە ‹آن قانون را مالاندند: ئەو قانوونەیان هەڵوەشاندەوە›. هەروەها: **مالاندنی** ■ صفت مفعولی: **مالانده** (شێلراو)/ مصدر منفی: **نمالاندن** (نەشێلان)

**مال‌اندوزی** / mālandûzî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* زێڕئاخنی؛ ماڵ‌ئاخنی؛ کار و ڕەوتی کۆ کردنەوە و پاراستنی ماڵ و سامان، بەتایبەت پارە.

**مالایالام** / mālāyālām/: *اسم.* مالایالام؛ لە زمانە دراویدیەکانی باو لە باکووری ڕۆژاوای هیندووستاندا.

**مالباخته** / mālbāxte ، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ماڵ‌دۆڕاو؛ ماڵ‌بەخەسار؛ ماڵ‌براو؛ ئەوەی بە تەڵەکە یان زۆر ماڵ یا پارەیەکی لە دەست داوە.

**مالبند** / mālband ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* مالبەن؛ مێڵەیەک لە نێوان کەرستەی ڕاگواستن (وەک گاری، کالسکە) و چاروادا بۆ ڕاکێشان.

**مالت** / mālt/: [فرانسوی] *اسم.* جوانەخەڵە؛ جوانەجۆ؛ چەکەرەی خەڵە، بەتایبەت جۆ کە دوای خووساندن و چەکەرە دان وشکی دەکەنەوە و وەکوو خۆراکێکی بەقەوەت دەیخۆن و هەروەها بیرەی لێ‌دروست دەکەن.

▣ **تب مالت:** تای ماڵت؛ نەخۆشینی چڵکی بەدیهاتوو لە میکرۆبی برووسێلا کە دەبێتە هۆی تا، بێ‌هێزی، کەم‌خوێنی و دژداماوی.

**مالتوز** / māltoz/: [فرانسوی] *اسم. [شیمی]* ماڵتۆز؛ جۆرێک شەکر، بەرهەمی هیدرۆلیزی نیشاستە کە لە ئاودا دەتوێتەوە.

**مالتوسیانیسم** / māltusyānîsm, māltosiyānîsm/: [فرانسوی] *اسم.* ماڵتۆسیانیسم؛ ئامۆژەی فەلسەفی تووماس ماڵتۆس، بیرمەندی

ئینگلیزی (۱۷۶٦ــ ۱۸۳٤ ز.) کە لە زۆرتر بوونەوەی ئاپۆرەی جەماوەر لە چاو سەرچاوەکانی خۆراکدا باس دەکا و دەڵێ ئەگەر مرۆڤ بتوانێ بەر بە نەخۆشی، قات و قڕی و مردنی سروشتی بگری، ئەمجار لە برسیەتیدا قڕ دەبێ.

**مال‌خر** / mālxar ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ئەوەی ماڵی دزی دەکڕێ و دەیفرۆشێتەوە. هەروەها: **مال‌خری**

**مالدار** / māldār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. [قدیمی] دەوڵەمەند؛ دەوڵەمەن؛ دەوڵەتمەن؛ بوودە؛ زەنگین.

**مالدوست** / māldûst ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. ماڵدۆس؛ ماڵپارێز؛ هۆگری کۆکردنەوە و هەڵگرتنی ماڵ و سامان. هەروەها: **مالدوستی**

**مال‌رو** / mālrow/: [عربی/ فارسی] ☜ جادەی مال‌رو، **جاده**

**مالش** / māleš/: /اسم. ساوا؛ هەساو؛ ڕێخە؛ ماڵ؛ مشت و ماڵ؛ پەرخ؛ وەرژوو.

▣ **مالش دادن**: شێلان؛ ولاوین؛ ماڵین؛ مالای؛ پەرخاندن؛ هەڵولاین؛ دەست پێداماڵین ‹پایم درد می‌کرد مالش دادم کمی بهتر شد: لاقم دێشا، شێلام، نەختێک سرەوی›.

**مالش رفتن**: هێز نەمان؛ شل بوونەوە؛ سست بوونەوە؛ بێ‌هێز بوون؛ داهێزان ‹از گرسنگی دست و پایم مالش می‌رود: لە بەر برسیەتی هێز لە دەست و پێمدا نەماوە›.

**مال‌فروش** / mālfurûš ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] اسم. چێودار؛ چێوار؛ بزگیر؛ ئەوەی چوارپێی بارکێش و مەڕ و مالات دەفرۆشێ.

**مالک**[1] / mālek ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. مالک: ۱. ئاغا؛ دەرەبەگ؛ خاوەن زەوی و زاری وا کە چەن کرێکار و بنەماڵەی بە سەرەوە بێ ۲. خاوەن چەن چاوە ماڵ و دووکان کە بە کرێ درابن.

**مالک**[2]: صفت. خاوەن؛ خودان؛ خاوەند؛ خێو؛ خێوەند؛ مالک ‹هر کسی مالک جان و مال خودش است: هەر کەس خاوەن گیان و ماڵی خۆیە›.

**مالکانه** / mālekāne/: [عربی/ فارسی] صفت. مالکانە؛ سەر بە مالک ‹بهرەی مالکانە: داهاتی مالکانە›.

**مالکی** / mālekî/: [عربی]/اسم. مالکی: ۱. یەکێ لە چوار مەزەبی بەناوبانگی موسوڵمانانی سوننی کە لە لایەن ئیمام مالکی کوڕی ئەنەس (٦٩-۱۷۸ ک.م.) دامەزراوە ۲. /ـها؛ ـان/ هەر کام لە شوێنکەوتووانی ئەو مەزەبە.

**مالکیت** / mālekîyyat ، ـها/: [عربی]/اسم. خاوەنیەتی؛ خاوەندیەتی؛ خاوەنایەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خاوەن بوون.

▣ **مالکیت خصوصی**: خاوەنیەتی گەوشت/ گەوشتی؛ مافی کەسی و تایبەتی بۆ خاوەنداریەتی ماڵ و کەلوپەل یان کڕین و فرۆشتن و دەستەوایان. بەرانبەر: **مالکیت دولتی؛ مالکیت عمومی/ همگانی**

**مالکیت دولتی**: خاوەنیەتی دەوڵەتی؛ ڕژیمێ کە ڕاژە و کەرستەکانی لە دەست دەوڵەتدایە. بەرانبەر: **مالکیت خصوصی**

**مالکیت عمومی/ همگانی**: خاوەنیەتی گشتی؛ مافی هەموانی بۆ کەلک وەرگرتن لە ڕاژە و بەرهەمەکانی. بەرانبەر: **مالکیت خصوصی**

**مال‌مردم‌خور** / mālemardomxor ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. [گفتاری] ماڵ مەردم‌خۆر؛ هۆگر و دەمەچەشتەی ماڵی خەڵک.

**مألوف** / ma'lûf/: [عربی] صفت. خووپێ‌گرتوو؛ پێ‌ڕاهاتوو؛ هۆکارە ‹روش مألوف: شێوەی خووپێ‌گرتوو›.

**مال‌ومنال** / māl-o-menāl, -manāl/: [عربی] اسم. [مجازی] ماڵ و سامان؛ ماڵ و دارایی؛ ماڵ و خێزان؛ کەیە و کولفەت ‹آن خدابیامرز مال و منالی نداشت: ئەو خوا لێ‌خۆشبووە ماڵ و سامانێکی

نەبوو›.

**ماله** / māle ، ـها/: *اسم. [بنایی]* کەمچە؛ ماڵە؛ ماڵنج؛ ئامرازی پێدا ماڵین و لووس‌کردنی ماکی شلی وەک قوڕ و گێچ و سیمان.

▣ **ماله کشیدن:** ماڵەکردن؛ ماڵەکێشان؛ بە ماڵە سواغ دان لووس کردن.

**مالی** [1] / mālî /: [عربی] *صفت.* ماڵی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ماڵ و دارایی ‹کمک مالی: یارمەتی ماڵی›.

ـ **مالی** [2]: *پیواژه.* ـ ماڵی؛ کار یان ڕەوتی ماڵین و ساوین ‹نمدمالی: نەوگ‌ماڵی›.

**مالیات** / māliyāt ، ـها/: [عربی] *اسم.* پیتاک؛ بەرج؛ مالیات؛ خەراج؛ خاراج؛ خووە؛ خووک؛ خووێک؛ مەکات؛ باجی دەوڵەت؛ پارەیێ کە دەوڵەت بە گوێرەی قانوون لە خاوەن‌ماڵانی دەستێنێ و لە حیسابی داهاتە گشتیەکانی دەخا.

▣ **مالیات زمین:** زەویانە؛ باجی زەوی؛ بەرجی تایبەت کە لە خاوەن زەوی دەسێندرێ.

**مالیات غیرمستقیم:** پیتاکی ناڕاستەوخۆ؛ پیتاکێ کە دەوڵەت لە بەرامبەر خستنە بازاڕی بڕێ کالا لە پیشەساز یان بازرگانی ئەسێنێ.

**مالیات مستقیم:** پیتاکی ڕاستەوخۆ؛ مالیاتێ کە دەوڵەت ڕاستەوخۆ لە خاوەن‌ماڵی دەستێنێ.

▣ **مالیات بستن:** پیتاک/ ماڵیات پێوە بەستن؛ دەسنیشان‌کردنی پارەیەک بە ناوی ماڵیات بۆ دان بە دەوڵەت.

**مالیاتی** / māliyātî /: [عربی] *صفت.* پیتاکی؛ ماڵیاتی؛ پێوەندیدار و سەر بە ماڵیات.

**مالیخولیا** / mālîxûl(i)yā /: [معرب از یونانی] *اسم.* مەیخوولی؛ ماخولیا؛ ئەسپەک؛ نەخۆشیەکی هزر و بیرە نەخۆش تووشی ژاکان، خەیاڵات و وڕاوە دەکا.

**مالیخولیائی** / mālîxûl(i)yā'î /: [معرب] ☜ **مالیخولیایی**

**مالیخولیایی** / mālîxûl(i)yāyî /: [معرب] *اسم.* مالیخولیایی: ١. سەر بە مالیخولیا ‹افکار مالیخولیایی: بیری مالیخولیایی› ٢. /ـها/ تووشی مالیخولیا ‹بیمار مالیخولیایی: نەخۆشی مالیخولیایی›

❊ **مالیخولیائی**

**مالیدن** / mālîdan /: *مصدر. متعدی. لازم. //* **مالیدی:** ساویت؛ **می مالی:** دەساوی؛ **بمال:** بساوە// ☐ *متعدی.* ١. ساوین؛ هەڵساوین؛ پێدا/ پیا ساوین؛ هەسوون؛ ساوان؛ تێ‌هەڵساوین؛ ساوەی؛ ساوای؛ هەنووون؛ هەنوین؛ هەنوان؛ ماڵین؛ ماڵەی؛ ماڵای؛ ماڵکۆنن؛ سوونەوە؛ هێسین؛ سەیاندن؛ تێ‌هەڵسوون؛ ڕووبەڕێک بە شتێکەوە تلاندن ‹روغن به چیزی مالیدن: ڕۆن بە شتێکدا ساوین› ٢. پێدا/ پیا هێنان؛ ئاردە پۆرەری؛ شێلان؛ شێلاندن؛ شێلانن؛ شێلەی؛ شێلای؛ شێلتەی؛ پروونەی؛ قامک یان دەست بە شتێکدا هێنان ٣. ساوین؛ پیاساوین؛ ساوەی؛ ساوای؛ پێدا هێنان؛ پۆرەرە ئاردەی؛ پەرخاندن؛ بوونە هۆی لێکەوتن و لێکخشینی دوو شت ‹دست را به دیوار مالید: دەستی بە دیوارەکەدا ساوی› ☐*لازم.* ٤. *[گفتاری]* فەوتان؛ نەمان؛ هەڵوەشانەوە؛ شێویانەوە؛ هەڵوەشێوان؛ بەتاڵ بوونەوە ‹پول ما هم مالید: پارەکەی ئێمەش فەوتا›. هەروەها: **مالیدنی**

■ صفت فاعلی: **مالنده** (ـ)/ صفت فاعلی: **مالیده** (ساوراو)/ مصدر منفی: **نمالیدن** (نەساوین)

**مالیه** / mālîy(y)e /: [عربی] *اسم. [قدیمی]* دارایی؛ ناوی پێشووی مەرزینگەی دەوڵەتی سەندنی پیتاک.

**مام** / mām /: *اسم. [ادبی]* دایک؛ داک؛ دایە؛ داڵک؛ ئەدا.

**ماما** / māmā /: *اسم.* ١. /ـها/ ماما؛ مامان؛ مامانە؛ پیرک؛ ماهو؛ ناوک‌بڕ؛ ژنێ کە لە زاندا ئاریکاری دایک دەکا ٢. دایکە؛ دایا؛ دادە؛ ناوێک بۆ دایک ‹ماما گرسنه‌ام، چیزی بده بخورم: دایکە برسیمە،

شتیکم بدەیە بخۆم›.

**مامائی** / māmā'î/ ☜ **مامایی**

**مامان**[1] / māmān/: *اسم. [گفتاری]* دایـک؛ داک؛ دالک؛ دایە؛ ئەدا؛ ئۆدا ‹مامانم منتظر است: دایکم چاوەڕوانە›.

**مامان**[2]: *صفت. [گفتاری]* ژیکەلـە؛ ژیکەلانـە؛ زۆر جـوان و خۆشەویسـت ‹بچـەی مامـان: منداڵـی ژیکەلە›: **مامانی**

**مامانی** / māmānî/ ☜ **مامان**[2]

**مامـایی** / māmāyî/: *اسـم.* مـامۆنی؛ مامـانی؛ مامایی؛ پیرکی: ۱. لقێک لە زانسـتی بژیشـکی کە دەپەرژێتە سەر زگ و زا و پـێش و پاشـیەوە ۲. کار و پیشەی ماما ✻ **مامائی**

**مامشهر** / māmšahr ، ـها/: *اسم.* دایکەشار؛ شـاری گەورەی ناوەندی پارێزگا یان وڵاتێک.

**مأمن** / ma'man ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* داڵـدە؛ پەناگا؛ هێور ‹آنجا مأمن دزدان شده بود: ئەوێ ببـووە داڵدەی دزان›.

**ماموت** / māmût ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* مـامووت؛ ئـەو فیلانـە لـە سـەرەتای دەورانی چـوارەمی زەویناسیدا ژیاون و لەشی زۆر گەورە و تـووکن و عاجی درێژ و پێچراویان هەبووە.

**مـأمور** / ma'mûr ، ـهـا؛ ـان؛ ـیـن/: [عربـی] *اسـم.* ڕاسپاردە؛ ڕاسپارە؛ ڕاسپێراو؛ کارگێـڕ؛ کاربگێـڕ: ۱. فەرمانبەر؛ کاربەدەستی بـەرەژێری دەوڵـەت ‹مـأمور دولـت: کارگێـڕی دەوڵـەت› ۲. ئەنـدامی هێزی چەکداری ۳. *[مجازی]* ئەوەی بـە دزیـەوە بۆ شوێنێ کار دەکـا ‹مـأمور سـاواک: ڕاسـپاردەی ساواک›.

▣ **مأمور انتظامی**: ئەندامی هێزی چەکـداری بـۆ پاراستن و بەڕێوەچوونی قانوون و دامـەزرانی هێمنی.

**مأمور پُست**: پۆستچی؛ پۆستەچی؛ ڕاسپاردەی پۆسـت بـۆ گەیانـدنی بەسـتەی پۆسـتی بـە شوێنی خۆی.

**مأمور تأمینات**: *[قدیمی]* زختی؛ پیاوی دارۆغـە: **مأمور شهربانی**

**مأمور شهربانی** ☜ **مامور تأمینات**

▣ **مأمور بودن**: ڕاسپاردە بوون. هـەروەها: **مامور شدن؛ مامور کردن**

**مأموریـت** / ma'mûrîyyat ، ـهـا/: [عربـی] *اسم.* ڕاسپاردەیی؛ ڕاسپارەتی؛ ئەو کارەی لە سـەرەوە بە کەسێک سپێردراوە. هەروەها: **ماموریت دادن؛ ماموریت گرفتن**

**مـأموم** / ma'mûm ، ـان/: [عربـی] *اسم.* ئـەوەی دەکەوێتە شوێن ئیمام یان پێشەوایەک.

**مـامیران** / māmîrān ، ـهـا/: *اسـم.* مـامیران؛ پەنجەداڵ؛ گوڵەئاران؛ ئالفە گیایەکی پایایـە بـە گەڵای سەوزی کـاڵ، گوڵـی زەردی هێشـوویی چەترئاسا و میوەی باریک و درێژەوە کە هـەموو ئەندامانی شیلەیەکی نارنجی ژەهراوییان هەیە.

**مامیزه** / māmîze/: *اسم.* مـارەزا؛ مـارزا؛ پیسـی زارۆ لە سەرەتای لە دایک بوونیدا.

**مان** / mān/: [؟] *اسم.* جـەوی؛ جیـوە؛ جـەوگ؛ هەنگوژە؛ هـەنگووژە؛ بـەرەژە؛ گـەرجن؛ زەمـق؛ شیلەی دار و گیـا کـە لـە شـوێنی قەڵەشـان و پێـوەدانی جـڕ و جانـەوەرەوە دەدەڵـێت (وەک ترنجەبین و گەزۆ).

**ـ مان**[1] / mān/: *ضمیر.* ـ مان: ۱. ـ مـا؛ جێنـاوی لکاوی خاوەندی بۆ یەکەم کەسی کـۆ ‹دسـتمان؛ پایمـان: دەسـتمان؛ لاقمـان› ۲. ـــ یـنی؛ ـ مـێ؛ جێناوی لکاوی بەرکاری بۆ یەکـەم کەسـی کـۆ ‹خوردمان؛ بردمان: خواردینی؛ بردینی›.

**ـ مان**[2]: *پسوند.* ـ مان: ۱. شوێنی بـوونی شـتێک ‹دودمان: نیشتمان› ۲. بـۆ دەربـڕینی حاڵـەتێک ‹شادمان؛ پشیمان: شادمان؛ پەشیمان›.

**مانا** / mānā/: *صفت.* بـەردەوام؛ پایـار؛ ڕاوەسـتاو؛ خۆڕاگر.

**مانتو** / mānto ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* مانتۆ؛ کراس یان کەوای زۆرتر فش و فۆل و درێژی ژنانە کـە

به سەر جلەوە لە بەری دەکەن.

**مانتوسرا** / māntosarā ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. مانتۆفرۆشی؛ فرۆشگای مانتۆ.

**مانتول** / māntol/: [؟]/اسم. [شیمی] مانتۆل؛ ئەلکولی نێو زۆربەی ڕۆنە بۆندارەکان کە لە عەترسازی و شیرینیپەزی و هەروەها بۆ دەرمان، وەکوو سڕکەر و دژی ئیسپاسم بە کار دەچێ.

**ماند** / mānd/:/اسم. [فیزیک] بەردەوامی؛ تایبەتمەندیەک لە ماکدا کە تا هێزێکی دەرەکی کاری لێ نەکا، یەکجۆر و بێگۆڕان لە جم یان نەجمی خۆیدا دەمێنێتەوە: **لَختی**

**منداب** / māndāb ، ـها/:/اسم. گەنکاو؛ پەنگاو؛ مەنداو؛ مەنداڤ؛ پەنگاڤ: ١. گۆلە ئاوێ کە لە یەک جێگادا ماوەتەوە و گەنیوە ٢. شوێنی کۆ بوونەوەی ئەو ئاوە.

**ماندارن** / māndāran/: [چینی]/اسم. ماندارەن؛ ماندارین؛ زمانی یەکگرتوو و باوی چین.

**ماندایی** / māndāyî/ ☜ **مَندایی**

**ماندگار**[1] / mand(e)gār/:/اسم. جێگیر؛ جێگر؛ ئەوەی لە ولاتێک بێجگە زێدی خۆی ژیان دەداتە سەر، بەتایبەت کەسێ کە لە دەورانی ولاتگریدا بەرەو ولاتێکی تازە دەست بە سەردا گیراو کۆچ و باری دەکرد و لەوێ دەمایەوە.

**ماندگار**[2]: صفت. ماندگار: ١. مەندۆخ؛ بەردەوام؛ بمێن؛ بە تەمەن و شیاوی مانەوە ‹کتاب ماندگار: کتێبی مەندۆخ› ٢. بەن؛ بەنگ؛ بەند ‹اینجا ماندگار نشد: لێرە بەن نەبوو›.

**ماندگاری** / mand(e)gārî/:/اسم. مەندۆخی؛ بمێنی؛ پایەداری؛ بەردەوامی؛ ئەلکردی؛ چۆنیەتی مانەوە و نیشتەجێ بوون.

**ماندگی** / māndegî/:/اسم. ١. پەزێرەیی؛ شەومەنەیی؛ دۆخ و چۆنیەتی مانەوە ٢. ماندوویی؛ ماندوویەتی؛ مانگی؛ مانیاگی؛ مانیایی؛ مانەکی؛ ماندوێتی؛ کەشەنگی؛ لە جمو‌جووڵ کەوتوویی بە هۆی ماندوو بوونی زۆرەوە.

**ماندن** / mandan/: مصدر. لازم. // **ماندی**: مای؛ **میمانی**: دەمێنی؛ **بمان**: بمێنە// ١. مان؛ ماین؛ مانەوە؛ مەنن؛ مەنەی؛ مەنای؛ درێژە دان بەوەی وا هەیە ‹زنده ماندن: زینوو مان› ٢. مانەوە؛ مەنن؛ ئەوەمەنەی؛ مەنایوە ‹در جایی ماندن: لە شوێنێک مانەوە› ٣. مانەوە؛ مەنایوە؛ هیچ ئاڵوگۆڕێک بە سەردا نەهاتن ‹همەچیز سر جایش مانده است: هەموو شتێ لە جێگای خۆیدا ماوەتەوە› ٤. [گفتاری] لە پا کەوتن؛ وێسان؛ مانگ بوون؛ مانیەی؛ مانیای ٥. [گفتاری] مانەوە؛ دامان؛ تێمان؛ ئەوەمەنەی؛ مەنایوە ‹ماندم چە بگویم: مامەوە چی بێژم› ٦. [ادبی] لێ چوون؛ شێوە دان؛ مانەی؛ مینستن ‹مثل گلی میماند کە تازە شکفتە باشد: لە گوڵێ دەچێ تازە پشکووتبێ›.

■ صفت مفعولی: **مانده** (ماو)/ مصدر منفی: **نَماندن** (نەمان)

**ماندنی**/ māndanî/: صفت. مەندۆخ: ١. بەدەوام؛ پایەدار؛ پایار ٢. بەکەڵک و لەبار بۆ مانەوە ٣. نیشتەجێ؛ دانیشتوو؛ جێگر؛ جێگیر ‹در آنجا ماندنی شدیم: لەوێ نیشتەجێ بووین›.

**ماندولین** / māndolîn ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ماندولین؛ ئامرازێکی مووسیقا، کاسەی وەک دیوان و دەستەی وەک عوود بە چوار جووت سیمەوە.

**مانده**[1] / mānde ، ـها/:/اسم. ١. ماوە؛ ماو؛ ماگ؛ باقی ‹شش تایش را فروختەایم، ماندە چهار عدد: شەشیمان فرۆشتووە، ماوەی چوار دانەیە› ٢. پاشماوە؛ بەرماو؛ پەسمەنە ‹ماندەاش را دور بریز!: پاشماوەکەی بڕێژە!›.

**مانده**[2]: صفت. ١. ماندوو؛ مانوو؛ مانی؛ ماندی؛ مانیا؛ مانگ؛ مانیاگ؛ ماندگ؛ ماندک؛ شەکەت؛ کەشەنگ ٢. ماوە؛ کۆنە؛ شەومەنە؛ شەومەنده؛ شەوەسار؛ شەوەساره؛ ئەوەمەنێ؛ پەزێرە؛

ئەوەمەنە ‹خوب نیست غذای مانده جلوی مهمان بگذاریم: جوان نیە چێشتی ماوە بۆ میوان دانین›.

**ماندینگو** / mândîngo/: [؟]/سم. ماندینگۆ: ۱. هۆزی ڕەشپێستی ڕۆژئاوای ئەفریقا ۲. /ـها/ هەرکام لە خەڵکی ئەو هۆزە ۳. زمانی ئەو هۆزە.

**مانستن** / mānestan/: مصدر. لازم. [ادبی] // **مانستی**: مینستی؛ **می مانی**: مانای / / مینسن؛ مانسن؛ وێچوون؛ شوبهین؛ لێ کردن؛ (لێ)چوون؛ مانەی؛ شیەیەوە ونەی؛ وێنەی شتێک بوون ‹فرشی داشتم بیشتر به جُل میمانست: یەی فەرشی داشتم مینسنە جلشاڵ›.

**مانع**[1] / māne'، ـها؛ موانع/: [عربی]/سم. کۆسپ؛ لەمپەر؛ بەرگر؛ تەگەرە؛ بەست؛ قۆرت؛ بەرلێ گر؛ ڕاگر؛ پێشگر؛ چەت؛ بەرهەڵست؛ گیرەوە؛ گەپل؛ دارەست؛ ئەوەی بەر بە کار یان ڕووداوێک دەگرێ ‹سعی کن مانع را از سر راهش برداری: هەوڵ بدە کوسپی لە سەر ڕێ لابەری›.

**مانع**[2]: صفت. بەرگر؛ پێشگر؛ قۆرت؛ بەرهەڵست ‹مانع کار چیست؟: بەرگری کار چیە؟›.

◘ **مانع بودن**: بەرگر بوون؛ لەمپەر بوون؛ ڕاگر/ بەرهەڵست بوون؛ نەهێشتن؛ ناسەی ‹سرمای هوا مانع بود: سەردی کەش بەرگر بوو›.

**مانع تراشیدن**: کۆسپ/ ڕێخ/ نوک تێخستن؛ کوچک خستنە سەر ڕێ؛ لەمپەر دروست کردن بۆ کەسێک بەشکوو بە مەبەستی نەگا.

**مانع شدن**: بەرگرتن؛ بەرگری کردن؛ گلەودان؛ ڕێ لێ گرتن ‹دربان مانع شد، نگذاشت تو بروم: دەرکەوانەکە بەری گرتم، نەیهێشت بچمە ژوورەوە›.

**مانعةالجمع** / māne'atolcam'/: [عربی] صفت. دژکۆ؛ دژ و ناجۆر لە کۆ بوونەوەدا ‹بزدلی با شجاعت مانعةالجمع است: ترسەنۆکی و ئازایەتی دژکۆن›.

**مانک** / mānak/:/سم. جێگایەکی گرۆڤەر بۆ کایە و هەڵتیقانی زارۆ تێدا: **پارک بچە**

**مانکن** / mānkan، ـها/: [فرانسوی]/سم. مانکەن: ۱. ئەو کەسە جلوبەرگی نوێ و تازەباو لە بەر دەکا و بە کڕیارانی پیشان دەدا ۲. پەیکەرێک لە مرۆڤ بۆ ڕانانی جلوبەرگی نوێ و تازەباو ۳. پەیکەرێک لە مرۆ بۆ ڕاهێنانی وەرزشی و فێر کردنی وەرزشوانان.

**مانگانین** / māngānîn/: [؟]/سم. مانگانین؛ ئالیاژی مەنگنیز و مس.

**مانگرو** / māngro/: [؟]/سم. مانگرۆ؛ دارێکی بەرز و بارێکی لێرەواره، چێوێکی ڕەش و پتەوی هەیە بۆ پیشەسازی بە کار دێ.

**مانند**[1] / mānand/:/سم. هاوماڵ؛ هاوتا؛ وێنە؛ مانەن؛ هاوچەشن؛ هەڤری؛ نۆلانی ‹او در شکار مانند ندارد: لە ڕاودا هاوماڵی نیە›: **مثل**

**ـ مانند**[2]: پیوازه. ـ ئاسا؛ ـ وێنە؛ شێوە؛ ـ شێوە؛ وێنەـ ؛ ـ ین؛ ـ ینە؛ ـ گوێن؛ ـ نیشە؛ ـ پەکە؛ ـکوێن؛ ـ بار؛ ـ ئاسایی؛ ـ مانەن؛ ـ گۆر؛ ـ فەن ‹شیرمانند؛ فرشتەمانند: شێرئاسا؛ پەریوێنە›.

**مانند** / mānande/: حرف. وەک؛ وەکوو؛ وەکا؛ عەین؛ عەینی؛ عەینوو؛ وێنەی؛ شێوەی؛ گوێن؛ لە گوێن؛ نۆلا؛ نۆتل؛ وەکی؛ هەزەی؛ تای؛ تاو؛ چون؛ چەشنی؛ لە چەشنی؛ لە تەرزی؛ هەردە؛ ڕەنگی؛ تەراز؛ شب؛ شبی؛ شتی؛ گۆر؛ گۆرەبا؛ پیسەو؛ هۆسا؛ ئاسای؛ مسلاس؛ داکینو؛ واکینۆ؛ وەچکوو؛ وەکوونێ؛ چما؛ چمان؛ هۆلێ؛ هۆسە؛ نال؛ مینا؛ گوهارتۆ ‹مانندِ شیر؛ مانندِ آتش؛ مانندِ گُل: وەک شێر؛ چەشنی ئاور؛ چما گوڵ›.

**ماندگی** / mānandegî/:/سم. هاوچەشنی؛ هاووێنەیی؛ هاوشێوەیی؛ وێکچوویی؛ میناکی؛ لێکچوویی؛ دۆخ و چۆنیەتی وەک یەک بوون.

**مانور** / mānovr، ـها/: [فرانسوی]/سم. مانۆڕ: ۱. کار و ڕەوتی خۆ ڕاهێنانی هێزە چەکداریەکان بۆ شەڕ ۲. چالاکیەکی چەکداری بۆ گۆڕانی بار و دۆخی گۆرەپانی شەڕ ۳. خۆ نواندن و خۆ گۆڕانێکی فیڵەبازانە.

⊡ **مانور دادن:** مانۆڕ دان؛ بەڕێوە بردنی مانۆڕ.

**مأنوس** / ma'nûs/: [عربی] *صفت.* لسکە؛ هۆگر؛ ئۆگر؛ هۆکارە؛ ستون؛ متون؛ فێرەک؛ لۆس؛ متۆ؛ بان؛ خووپێ‌گرتوو.

⊡ **مأنوس شدن:** هۆگر بوون؛ خووگرتن؛ لۆس بوون ‹آنها با هم مأنوس شده بودند: ئەوان هۆگری یەک ببوون›.

**مانومتر** / mānometr ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* تەوژم‌پێو؛ گوشارپێو؛ ئامرازی پێوانی گوشار (هی کەش یان هەڵم و ...).

**مانوی**[1] / mānavî ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* مانەوەی؛ شوێنکەوتووی دینی مانی پێغەمبەری ئێرانی (٢١٥ـ ٢٧٦ زایینی).

**مانوی**[2]: *صفت.* مانەوی؛ پێوەندیدار یان سەر بە مانی ‹کتاب مانوی: کتێبی مانەوەی›.

**مانیا** / mānyā/: [؟] *اسم. [روان‌شناسی]* شەیدایی؛ خولیایی؛ شێتی؛ مانیاکی؛ لێوەیی.

**مانیاک** / mānyāk/: [؟] *صفت. [روان‌شناسی]* شەیدا؛ شێت؛ مانیاق؛ مانیاک؛ لێوە؛ دین.

**مانیتیسم** / mānyetîsm/: [فرانسوی] *اسم.* مانیتیسم: ١. تاقمێک لە دیاردەگەلی فیزیکی کە بۆ خۆیان بەرچاو نین و کاردانەوەکەیان دیارە، وەک ئاسن بەرەو خۆکێشان لە ئاسنکێشدا ٢. زانستی دیاردەگەلی میگناتیسی.

**مانیفست** / mānîfest ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ئاگادارینامە؛ ئاگادارنامە؛ پەرتووکی ڕاگەیاندن؛ نووسراوەیەک لە لایەن پارت، تاقم یان کۆمەڵێکەوە، نوێنەری بیر و بۆچوون و بڕوایان.

**مانیکور** / mānîkûr/: [فرانسوی] *اسم.* لاک ناخن ☜ **لاک ـ٣**

**مانیکوریست** / mānîkûrîst ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* کەسێ کە ناخوون دەڕازێنێتەوە.

**مأوا** / ma'vā ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ١. نشینگا؛ نشینگە؛ جێگای مانەوە ٢. پەناگا؛ هێور؛ داڵدە.

⊡ **مأوا کردن/ گُزیدن:** نیشتەجێ بوون؛ نیشتن؛ ئاکنجی بوون؛ هێورین.

**ماورا** / māvarā/: [عربی] *اسم.* ژوور؛ سەر؛ ئەوپەڕ؛ ئەوی لە سەروو یان ئەو سەری شوێنێ یان شتێکەوەیە.

**ماورای** / māvarāye/: [عربی] *حرف.* ١. ژووری؛ ژوورەوەی؛ سەری؛ بان‌تر لە؛ سەرتر لە ٢. ئەوپەڕی؛ ئەوسەری.

⊡ **ماورای بنفش** ☜ **فرابنفش**

**ماورای طبیعی:** ژوورە سروشتی: ١. سەر بەو بوونەوەرانەی لە سروشتدا دەست ناکەون (وەک فریشته، ڕۆح، جن) ٢. دەر لە دەڤەری کاریگەری قانوونی سروشت.

**ماوس** / māows, māo:s ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* مشکە؛ مشکەڵە؛ مەوس؛ ماوس؛ کەرستەیەکی دەستی بۆ بزواندنی نیشاندەر لە سەر شاشەی کەمپیوتەر: **موشواره**

**ماوقع** / māvaqa'/: [عربی] *اسم.* ڕووداوە؛ ڕووداو؛ ڕاستی ڕووداو؛ ئەوەی ڕووی داوە ‹آرام آمد و ماوقع را برایم تعریف کرد: ئارام هات و ڕووداوەکەی بۆم گێڕاوە›.

**ماه** / māh/: [عربی] *اسم.* مانگ؛ مانگە؛ مۆنگە؛ مۆنگ؛ هاییڤ؛ هەڤی؛ هەوی؛ کاوت؛ مەهـ؛ هەیوی؛ هەیڤ؛ مات: ١. تەنێکی ئاسمانی کە لە هەر ٢٩,٥ شەوانەڕۆژدا جارێک لە دەوری زەوین هەڵدەسووڕێ و لە بەر تیشکی تاو دەدرەوشێتەوە ٢. هەر تەنێکی ئاسمانی کە لە دەوری شتێکدا هەڵبسووڕێت ٣. *[مجازی، گفتاری]* شتی زۆر جوان ٤. *ـها/* بەشێ لە دوازدە بەشی ساڵ کە ٢٨ تا ٣١ شەوانەڕۆژە و لە هەر زمانێکدا ناوێکی هەیە ‹در چه ماهی به دنیا آمده‌ای؟ اردیبهشت: لە چ مانگێکدا لە دایک بووی؟ گولان›.

⊡ **ماه به ماه:** مانگەومانگ؛ مانگ‌بەمانگ؛ مانگ‌وەمانگ؛ هاشمە؛ ئاشمە؛ مانگانە؛ هەر بە سی ڕۆژ جارێ ‹ماه به ماه اجاره‌اش را می‌گرفت و می‌رفت: مانگەومانگ کرێکەی وەردەگرت و

دەڕۆیشت›.

ماه تمام: بەدر؛ هەلاب؛ هەلاب؛ مانگی پڕ؛ مانگێ پەڕە؛ مانگی چواردە؛ مانگێ چواردێ: **ماه شب چهارده**

ماه خورشیدی ☜ **ماه شمسی**

ماه شب چهارده ☜ **ماه تمام**

ماه شمسی: مانگی هەتاوی؛ مانگی ڕۆژی؛ مانگەکانی ساڵی هەتاوی: **ماه خورشیدی**

ماه عسل: ۱. هەوەڵین مانگی پاش زەماوەن ۲. سەفەری ژن و مێرد لەو مانگەدا.

ماه قمری: مانگی کۆچی؛ مەودای نێوان جارێک سووڕانی مانگ لە دەوری زەوی تا سووڕانێکی‌تر.

ماه میلادی: مانگی زایینی؛ هەرکام لە مانگەکانی ساڵی زایینی.

ماه نو: مانگی نۆ/ نوێ؛ مانگی تازە؛ مانگێ تازێ؛ سەرەتای هاتنی مانگ.

▣ ماه درآمدن: هەڵاتنی مانگ؛ مانگ هەڵاتن؛ مانگ دەرهاتن؛ مانگ زیەی/ زیای؛ مانگ کەوتنە دیار.

ماه دیده شدن: مانگ بینران؛ مانگ دیتران؛ مانگ پیویەی ‹دیشب در کویت ماه دیده شد: دوێشەو لە کوەیتدا مانگ بینرا›.

ماه گرفتن: مانگ/ مان گیران؛ هەیڤ گرتن؛ گیرانی مانگ؛ مانگ‌گیریەی؛ ڕوودانی دیاردەی مانگ کەوتنە سێوەری زەوی و شاریانەوەی.

**ماها** / māhā/: *ضمیر. [گفتاری]* ئێمەمانان؛ مەمانان؛ ئێمەگەل؛ ئێمەیەل ‹ماها چه حرفی برای گفتن داریم؟: ئێمەمانان چیمان هەیە بۆ گوتن ؟›.

**ماهانه**[1] / māhāne/: *صفت.* مانگانە؛ مەهانی: ۱. سەر بە یەک مانگ ‹حقوق ماهانه: مووچەی مانگانە› ۲. مەهی؛ سەر بە مانگ ‹نشریەی ماهیانه: بەلاڤۆکی مانگانە› * **ماهیانه**

**ماهانه**[2]: *قید.* مانگانە؛ هاشمە؛ ئاشمە؛ لە هەر مانگێکدا ‹ماهانه پانصد هزار تومان اجاره مغازه می‌داد: مانگانە پێنسەد هەزار تمەن کرێ دووکانی دەدا›: **ماهیانه**

**ماهپاره** / māhpāre، ـها؛ ـگان/: *صفت. [مجازی]* مانگەشەو؛ مانگەشەوە؛ زۆر جوان وەک مانگ (بۆ ژن و کچ).

**ماهتاب** / māhtāb/ ☜ **مَهتاب**

**ماهر** / māher/: [عربی] *صفت.* کارامە؛ لێزان؛ زەبەردەست؛ تەڕدەس؛ چازان؛ ماهیر؛ لە کاردەرهاتوو؛ سەرڕاست؛ لە زەبر ‹صنعتگر ماهر: پیشەسازی کارامە›.

**ماهرانه** / māherāne/: [عربی/ فارسی] *قید.* بە لێزانی؛ لێزانانە؛ بە زانایی؛ بە کارامەیی ‹ماهرانه صدایش را عوض کرد: بە لێزانی دەنگی گۆڕی›.

**ماهرخ** / māhrox، ـان/: *صفت. [مجازی]* وەنگ‌مانگ؛ ڕوومەت‌مانگ: **ماهرخسار؛ ماهرو؛ ماه‌سیما؛ ماه‌منظر**

▣ ماهرخ رفتن: *[مجازی]* دابەڕزان؛ دابەڕزین؛ دابەڕزاندن؛ داڕسان؛ داڕسکان؛ پەلامار بردن؛ پەلەمار دان؛ هەڵمەت بردن؛ هەڵکوتانە سەر؛ شاتاڵ دان؛ ڕاقوتان؛ گورمژین؛ ملاز بردنەوە و لەپڕ پەلامار دان (بەتایبەت لە ڕاودا).

**ماهرخسار** / māhroxsār/ ☜ **ماهرُخ**

**ماهرو** / māhrû/ ☜ **ماهرُخ**

**ماه‌سیما** / māhsîmā/: [فارسی/ عربی] ☜ **ماهرُخ**

**ماهک** / māhak/: *اسم.* بەشی سپی و کەوانەیی بن نینۆک.

**ماه‌گرفتگی** / māhgereftegî، ـها/: *اسم.* ۱. ماگیرسە؛ ماگیرس؛ ماگرتە؛ مانگ‌گیران؛ هەیڤ‌غەییرین؛ ڕەوتی سێبەری زەوی کەوتنە سەر مانگ ۲. پەڵەی سووری لە سەر پێست (بەتایبەت دەم و چاو) کە بە هۆی گەشەکردنی زۆری وردەڕەگی ئەو جێگەوە بەدی دێ.

**ماه‌منظر** / māhmanzar/: [فارسی/ عربی] ☜ **ماهرُخ**

**ماهنامه** / māhnāme ، ـهـا/:اسم. مانگنامه؛ بەلاڤۆک، بەتایبەت گۆڤارێ کە مانگێ جارێ دەردەچێ.

**ماهواره** / māhvāre ، ـهـا/:اسم. ماهواره؛ ساتەلایت؛ کەرستە یان دەزگایێ کە لە خولگەی تەنێکی ئاسمانیدا دەگەڕێ.

▣ **ماهوارەی مخابراتی**: ساتەلایتێک بۆ هەناردن و وەرگرتنی دەنگ و ڕەنگ لە ڕێگەی دوورەوە.

**ماهوت** / māhût/: [هندی]/اسم. ماوت؛ ماهووت؛ پارچەیێکی فاسۆنی کولکنە دەکرێتە کەوا و پاتۆڵ و کۆت و شەلوار.

**ماهوت‌پاک‌کن** / māhûtpak.kon ، ـها/: [هندی/ فارسی]/اسم. ماوت‌سڕ؛ برۆسێک بۆ لێکردنەوە و سڕینی تەپ و تۆزی سەر قوماش.

**ماهوتی**[1] / māhûtî/: [هندی] ☜ **خرگوشک**

**ماهوتی**[2]: صفت. ماوتی؛ ماهووتی: ١. وەک ماهووت ٢. لە جنسی ماوت.

**ماهور** / māhûr/:اسم. ماهوور: ١. ـها/ زورکان؛ زوورکان؛ زووران؛ زورگە؛ هەڵەت؛ گەد؛ زوور؛ زوورک؛ زوورگ؛ هەرد و هەڵەت؛ زرگ و هەڵەت؛ بەرز و نزمی پاڵداوێنی کێو ٢. یەکێ لە حەوت دەزگای مۆسیقای ئێرانی.

**ماهون** / māhûn/ ☜ **آکاژو**

**ـ ماهه**/ māhe/: پیوازه. ـمانگە؛ ـمانگان؛ ـمانگ: ١. سەر بە ژمارەی مانگەکان ‹یک‌ماهه؛ ده‌ماهه: یەک‌مانگە؛ دەمانگە› ٢. بە تەمەن بە گوێرەی مانگ ‹بچەی چهارماهه: منداڵی چوارمانگان›.

**ماهوی** / māhovî/: [عربی] صفت. پێوەندیدار و سەر بە چیەتی.

**ماهی** / māhî/:اسم. ماسی؛ ماهی: ١. [نجوم] وێنەیەکی گەورەی گەردوونی نادیارە: **حوت** ٢. ـها؛ ـان/ مۆسە؛ ماساو؛ ماسا؛ ماساوی؛ ماسۆ؛ مای؛ مایی؛ ماسول؛ دەستەیەک لە گیاندارانی ئاوژی.

▣ ماهی آزاد ☜ **آزادماهی**

ماهی برقی ☜ **برق‌ماهی**

ماهی پهن: پانکە؛ ماسیەپانکە؛ جۆرێک ماسی پانکەڵەی خڕ کە ماسیتر دەخوا: **کَفشَک ماهی**

ماهی تن ☜ **تُن-٣**

ماهی حلوا ☜ **حلواماهی**

ماهی حوض: ماسی تۆنگ؛ ماسی حەوز؛ ماسیێکی ئێسقانی لە تیرەی کەپوور بە درێژی ٢٠ سانت و کەمتر، بە ڕەنگی سوور، تەلایی و برێ‌جار سپی.

ماهی خاردار: ماسی دڕکاوی؛ ماسیەکی تایبەتی ناوچەی گەرمیان، خاوەن باڵی دڕکدار و بچووک کە دەتوانێ لەشی پف بدا و وەک تۆپی لێ بکا: **خارپشت‌ماهی**

ماهی خاردار زرد ☜ **سوف‌ماهی**

ماهی خاویار: ماسی خاویار؛ دەستەیەک ماسی بریتی لە ئوزون برۆن، تاس‌ماسی و فیل‌ماسی کە گەراکەیان خاویارە و دەخورێ.

ماهی دودی: ماسی سپی کە خوێی پێوە دەکەن و قانگی دەدەن، ماوەیەکی زۆرتر دەمێنێتەوە و خراپ نابێ.

ماهی سفید: ماسی سپی؛ جۆرێک ماسی ئێسقانی زەریای خەزەر لە دەستەی کەپوو کە گۆشتەکەی زۆری خوازیار هەیە.

ماهی سنگسر ☜ **سَنگسَر**

ماهی سوف ☜ **سوف‌ماهی**

ماهی سیم ☜ **سیم-۴**

ماهی شوریده ☜ **شوریده**[1]

ماهی شیر ☜ **شیرماهی**

ماهی قباد ☜ **قُباد**

ماهی قزل‌آلا ☜ **قزل‌آلا**

ماهی کپور ☜ **کَپور**

ماهی کفال ☜ **کَفال**

ماهی کوسه ☜ **کوسه-۱**

**ماهی** / mâhî/: *قید.* مانگیێ؛ مانگێک؛ مانگیوه؛ مانگیه؛ هەر مانگ: ۱. مانگانه؛ لە هەر مانگدا ‹ماهی هزار تومان می‌گرفت: مانگی هەزار تمەنی دەگرت› ۲. لە نێو مانگدا؛ لە مانگدا ‹ماهی پنج روز استراحت می‌کرد: مانگی پێنج ڕۆژ دەحەسایەوە›.

**ماهیانه** / mâhiyâne/ ☜ **ماهانه**

**ماهی‌بوف** / mâhîbûf، ـها/: *اسم.* کوندەڕۆماڵ؛ کوندی ماسی‌خۆرە؛ جۆرێک کوندی زلی سەر وەک پشیلەیە، ماسی و قرژاڵ و پەلەوەر و جڕ و جانەوەری بچووک دەخوا.

**ماهیت** / mâhîyyat، ـها/: [عربی]*اسم.* چیەتی؛ سەرجەمی ئەو تایبەتمەندیانە شتێک دەناسێنێ و دەری‌دەخا کە چیە.

**ماهیتابه** / mâhîtâbe، ـها/: *اسم.* ماوریژ؛ تاوە؛ تابە؛ تاوێک؛ ئاخلیفینک؛ ڕمبیژ؛ ڕوونبێژ؛ ڕوونپێژ؛ موریژ؛ ڕمپێشک؛ کەرسوون؛ کەرسون؛ ناوسنگانە؛ ناولنگان؛ ئاخلەوێک؛ ئاغلەوێک؛ مەنجەڵووکەی پەل بۆ تێدا سوورکردنەوە: **تابە؛ تاوە**

**ماهیچه** / mâhîče، ـها/: *اسم.* ماسوولکە؛ ماسوولە؛ ماسۆڵە؛ ماسیلکە؛ ماسلکە؛ مالوسکە؛ مایچە؛ وەرسە؛ وەرسەلە؛ گردک؛ زەقلەک: ۱. جۆرێک شانەی لەشی گیانداران کە ئەندامان دەبزوێنێ ۲. *[متالورژی]* بەشێک لە قالب لە زیخ و جەوگ کە لە دارشتندا جێگا هلۆلەکان پڕ دەکاتەوە و دوایی لا دەبرێ.

▣ **ماهیچەی ارادی** ☜ **ماهیچەی مخطط**

**ماهیچەی صاف:** ماسوولەی ساف؛ چەشنێک ماسوولکە بە خانەی زل و درێژی وەک تەشیەوە کە هێواش و خۆمەش کرژ دەبنەوە، وەک ماهیچەی دەوری ورگ: **ماهیچەی غیرارادی**

**ماهیچەی غیرارادی** ☜ **ماهیچەی صاف**

**ماهیچەی مخطط:** ماسوولەی ڕێ‌ـڕێ؛ چەشنێ ماسوولە بە خانەی زل و درێژەوە کە زۆرتر لە یەک ناوکیان هەیە و خێرا و لە سەر ویست کرژ دەبنەوە، وەک ماسوولکەی ڕان: **ماهیچەی ارادی**

**ماهیچه‌ای** / mâhîče'î/: *صفت.* ماسوولکەیی؛ ماسوولەیی؛ زەقلەکی؛ سەر بە ماسوولە ‹بافت ماهیچه‌ای: شانەی ماسوولەیی›.

**ماهیچه‌نگار** / mâhîčenegâr، ـها/: *اسم.* *[پزشکی]* کەرستەیەک بۆ تۆمارکردنی ڕادەی هێز و خێرایی کرژ بوونەوەی ماسوولە: **میوگراف**

**ماهیخوار** / mâhîxâr/ ☜ مرغ ماهیخوار، **مرغ**

**ماهی‌خور** / mâhîxor، ـها/: *اسم.* ماسی‌خۆرە؛ شاهۆ؛ شاوە؛ شاڤ؛ ناوی چەن جۆر باڵندەیە کە لە قەراخی ئاودا دەژین.

**ماهی‌سرا** / mâhîsarâ، ـها/: *اسم.* ۱. دامەزراوەی ڕاگرتن و بەخێوکردنی ماسی ۲. شوێنی ڕاگرتنی ماسی بۆ سەیر و لێکۆڵینەوە.

**ماهیگیر** / mâhîgîr، ـها؛ ـان/: *اسم.* ماسی‌گر؛ ماساوگیر؛ ماسیەوان؛ کەسێ کە ڕاوە ماسی دەکا.

**ماهی‌گیری** / mâhîgîrî/: *اسم.* ڕاوەماسی؛ ماسی‌ڕاو؛ ماسی‌گری؛ کار و ڕەوتی ماسی گرتن.

**مایا** / mâyâ/: *اسم.* مایا: ۱. هۆزی سوورپێستی زاگەبەری ئەمریکاری ناوەندی ۲. /ـها/ خەڵکی ئەو هۆزە ۳. زمانی ئەو هۆزە.

**مایحتاج** / mâyahtâc/: [عربی]*اسم.* پێداویستی؛ پێویستی؛ ئاتاجی؛ نیاز ‹برای خرید مایحتاج مهمانی پول لازم دارم: بۆ کڕینی پێداویستەکانی میوانی پارەم پێویستە›.

**مایع**[1] / mâye'، ـها؛ ـات/: [عربی]*اسم.* تەوش؛ تراو؛ شل؛ شلە: ۱. یەکێک لە دۆخەکانی ماک کە وردیلەکانی لە سەر یەک دەخزێن بەڵام لێک جیا نابنەوە، بیچمی دەفرەکەی دەگرێ و لە تین و تەوژمێکی تایبەتدا دێتە کوڵ ۲. *[پزشکی]* هەر یەکە لەو تێکەڵاوانەی لەشی گیاندار کە ڕەوانە (وەک خوێن، میز و...).

▣ **مایع آمنیوتیک:** *[فیزیولۆژی]* سەراف؛ سەراڤـک؛ سەراو؛ تراوێکی خەستە لەگەڵ بوونی منداڵدا لە زگی دایکەوە دێتە دەر.

**مایع صافی:** تراوی پاڵاوتە؛ تراوی پاش پاڵفتن کە بێخەوشە.

**مایع ظرفشویی:** تراوێکی خەستی چڵکسڕە، چێشت و چەوری سەر دەفری پێ خاوێن دەکەنەوە.

**مایع**[2]: *صفت.* تراو؛ تەوش؛ ئاوەکی؛ ئاوئاسا.

**مایع‌سنج** / māye'sanc ، ـها/: [عربی/ فارسی]*اسم.* ئاوپێو؛ تراوپێو؛ کەرستەی پێوانی ڕادەی قورسی تراو لە سانتیمیترێکی چوارپاڵوودا.

**مـایکروویو** / māykroveyv/: [انگلیسی]*اسم.* مایکرۆوەیڤ؛ مەیکرۆوەیڤ: ۱. درێژایی شەپۆلی نێوان یەک تا سی میلیمیتر: **کهموج** ۲. کەرەسەیەک بۆ خێرا گەرمکردنی خۆراک بە هۆی پێلی مایکرۆوەیڤەوە * **ماکروویو؛ میکروویو**

**مایل** / māyel/: [عربی] *صفت.* ۱. خوازیار؛ مایل؛ هۆگر؛ داخواز ‹مایل بودم تو را ببینم: خوازیار بووم بتبینم› ۲. لار؛ خوار؛ گێڕ؛ تێل؛ تیل؛ چەوت؛ هێڵی ئاسۆیی ‹خط مایل: هێڵی لار›.

**مایل** / māyl/: [انگلیسی] ☜ **میل-۴**

**مای‌مرز** / māymarz ، ـها/: *اسم.* ڕەزلەگاوانە؛ مایەسیرە؛ دەوەنێکی کوڵی دوولاقە بە گەڵای وردی بۆنخۆشەوە کە بەرێکی گچکەی ئاوی دەگرێ، هەر کام چوار تا شەش دانە تۆمی خڕووکەی ڕەشی تێدا.

**مایملک** / māyamlak ، ـها/: [عربی]*اسم.* هەموو دارایی؛ ماڵ و سامان؛ دار و نەدار ‹مایملک او را مصادره کردند و خودش هم فرار کرد: هەموو داراییەکەیان دەست بە سەردا گرت و خۆیشی هەڵات›.

**مایو** / māyo ، ـها/: [فرانسوی]*اسم.* مایۆ؛ جلکی یەک تیکە یان دووتیکەی تەنگ بۆ مەلە.

**مـایور** / māyor ، ـها/: [؟]*اسم.* *[نامتداول]* سەرگورد؛ پلەکێ چەکداری خوارتر لە سەرهەنگ.

**مأیوس** / ma'yûs/: [عربی] *صفت.* دڵسارد؛ دڵسار؛ ناهومێد؛ ناهمێ؛ بێهێڤی ‹وقتی از او مأیوس شدم به سراغ تو آمدم: کە لەو دڵسارد بوومەوە، هاتمە لای تۆ›.

**مأیوسانه** / ma'yûsāne/: [عربی/ فارسی]*قید.* ناهمێیانە؛ دڵساردانە؛ بە ناهمێییەوە؛ لە ڕووی ناهومێدی و دڵبەدواییەوە ‹مأیوسانه پیش او رفتم و کمک خواستم: ناهمێیانە چوومە لای و داوای یارمەتیم کرد›.

**مـایونز** / māyonez/: [فرانسوی]*اسم.* مایۆنێز؛ جۆرێ سوسی سالاد کە لە خەردەل، هێلکە، ڕۆنی زەیتوون، سرکە و ئارد چێ دەکرێ.

**مایه** / māye/: *اسم.* مایە: ۱. هۆ؛ ئەوی شتێ بەدی بێنێ یا ببێتە هۆی شتێ ‹مایەی شادی: هۆی شایی› ۲. هەوێن؛ هوین؛ هەڤیان؛ هاڤێن؛ هامێن؛ هیوێن؛ هامیژن؛ ئامێژەن؛ ئامیان؛ هاڤین؛ هاڤەین؛ ئاڤین؛ مایەنە؛ چین؛ ماکی سەرەکی یان کاریگەر ‹مایەی پنیر: هەوێنی پەنیر› ۳. واکسەن؛ تێکەڵاوێک لە ویرووس و باکتری مردوو یان نیوەگیان کە بۆ بەرگری لە نەخۆشی، دەنێو لەشی دەکەن ٤. *[مجازی]* دەسمایە؛ سامان ‹بی مایه نمی‌شود کار کرد: بێ دەسمایە کار ناکرێ› ٥. *[موسیقی]* جۆرێک ڕیزکردنی نوتی مۆسیقا بۆ ئاهەنگێکی تایبەت ٦. *[مجازی]* هێزایی؛ ژێهاتی؛ لێهاتوویی؛ توان؛ توانست ‹آزاد می‌توانست ترقی کند، زیرا مایەی این کار را داشت: ئازاد دەیتوانی سەرکەوێ، بۆ ئەوە هێزایی ئەم کارەی هەبوو›.

▣ **مایه آمدن** ☜ **مایه گرفتن**

**مایه رفتن:** دانان؛ مەیە دان؛ خەرجکردنی پارە بۆ شتێ ‹هزار تومان برایش مایه رفتم تا گذاشت بروم: هەزار تمەنم بۆ دانا تا هێشتی بڕۆم›.

**مایه زدن:** مەیاندن؛ ئامێژەن کردن؛ ئامیان

لێدان.
**مایه گذاشتن**: ۱. خەرجکردن؛ دانان ‹مجبور شدم صد هزار تومان مایه بگذارم تا این گواهی را بگیرم: ناچار بووم سەد هەزار تمەن خەرج بکەم تا ئەم بەڵگەنامە وەرگرم› ۲. *[کنایی]* ڕێز و حورمەت گرتن ‹خیلی برای من مایه گذاشت که جریمه‌ام نکرد: زۆر ڕێزی گرتم کە جەریمەی نەکردم›.
**مایه گرفتن**: *[مجازی]* تێچاندن؛ خەنە/ هەرگ گرتنەوە؛ پیلان گێڕان، قسە بردن و پشتەسەر خراپە گوتن ‹پیش رییس برایش مایه گرفته بودند: لە لای سەرۆکەوە بۆیان تێچاندبوو›: **مایه آمدن**
**از مایه ضرر کردن**: خێر هاتن و مایە بردن؛ خەیر سەری مایە خواردن؛ خەرجی خۆ(ی) دەرنەهێنانەوە ‹اگر به این قیمت بفروشم، از مایه ضرر کرده‌ام: ئەگەر بەم قیمەتە بیفرۆشم خێر هاتووە و مایەی بردووە›.
**مایه دار** / māyedār/: *صفت. [گفتاری]* مایەدار: ۱. تێر؛ خەست و خۆڵ؛ پڕ لە ماکی سەرەکی ۲. دەوڵەمەن؛ مایەوەر؛ پووڵدار؛ دەسمایەدار؛ مایەبۆش ‹پدرش تاجر مایه‌داری بود: بابی تاجرێکی دەوڵەمەن بوو›.
**مایەکاری** / māyekārî/: *قید.* مایەبەش؛ مایەباشی؛ مایەکاری؛ بە نرخی سەندراو، نە زەرەر نە قازانج ‹فروشنده قالی را مایه‌کاری فروخت، چون پول لازم داشت: فرۆشیار قالیەکەی مایەبەش فرۆت، چونکوو پارەی پێویست بوو›.
**مایه کوبی** / māyekûbî/: *اسم.* کوتان؛ پەترمە؛ واکسیناسیون؛ کار و ڕەوتی تیرۆکردنی ویرووس و باکتری مردوو یان نیوەگیان بۆ ناو لەش بە مەبەستی بەرگری لە نەخۆش کەوتن.
**مباح** / mobāh ، ـها/: [عربی]*اسم.* ڕەوا؛ کارێ کە نە عەیبە و نە گوناهـ. هەروەها: **مباح بودن؛ مباح دانستن؛ مباح شدن؛ مباح شمردن؛ مباح کردن**
**مباحث** / mabāhes/: [عربی] جمعِ ☜ **مبحث**
**مباحثـات** / mobāhesāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مباحثه**
**مباحثه** / mobāhese ، ـها؛ مباحثات/: [عربی]*اسم.* قسەوباس؛ مچلگە؛ لێدوان ‹بارها با هم بر سر برتری شعر هژار یا هیمن مباحثه می‌کردند: زۆرجاران لە سەر هەڤیازی شیعری هەژار یان هێمن قسە و باسیان دەکرد›.
**مبادا**[1] / mabādā/: *صفت.* تەنگانە؛ تەنگایی؛ تەنگانی؛ لێقەوماوی؛ تەنگ و چەڵەمە؛ بە دۆخ یان چۆنیەتیەکی نەویستراو و ناحەزەوە ‹روز مبادا: ڕۆژی تەنگانە›.
**مبادا**[2]: *دعا.* نەک؛ نەکا؛ ناکا؛ نەکەی؛ نەوای، نەبادا؛ نەئەمەی؛ نەخۆ؛ نەخای؛ هاگات چنە بۆ؛ نەکوونێ؛ نەکای؛ نەوەک؛ نەوەکوو ‹مبادا در را باز کنی!: نەکا درگاکە بکەیەوە!›.
**مبادرت** / mobāderat/: [عربی]*اسم.* کار یان ڕەوتی قۆڵ لێ هەڵماڵین؛ دەس تێوەردان؛ دەست پێکردن؛ دەست کردن. هەروەها: **مبادرت کردن**
**مبادلات** / mobādelāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مبادله**
**مبادله** / mobādele ، ـها؛ مبادلات/: [عربی]*اسم.* کار و ڕەوتی گۆڕینەوە؛ وەگۆڕین؛ دان و سان: ۱. ئاڵوگۆڕ؛ ئاڵوویر؛ واروگۆڕ؛ شتێک دان و شتێک وەرگرتن لە باتی ‹مبادلەی اسناد: گۆڕینەوەی بەڵگە› ۲. گوتن و بیستنی قسە ‹مُبادلەی اخبار: دان و سانی قسە و باس› ۳. *[اقتصاد]* پێک گۆڕینەوەی پارەی وڵاتێک لەگەڵ پوولی وڵاتێکی تردا. هەروەها: **مبادله کردن**
◘ **مبادلەی پایاپای**: ڕشت؛ سەربەسەر؛ کاری شت گۆڕینەوەی بێ باقی دانەوە.
**مبادی** / mabādî/: [عربی] جمعِ ☜ **مبدأ**
**مبـادی آداب** / mobādî(y)ādāb, mabādî-/: [عربی] *صفت.* گونجاو؛ ڕێکوپێک؛ کردەوە جوان؛ بە کردەوەی هێژا و دەقاودەقی داب و نەریتی

کۆمەڵگاوە.

**مبارز**[1] / mobārez ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. خەباتکار؛ خەباتگێڕ؛ شەڕڤان؛ شەڕکەر ‹امروز دو مبارز دستگیر شدند: ئەمڕۆ دوو خەباتکار قولبەست کران›.

**مبارز**[2]: صفت. خەباتکار؛ خەباتگێڕ؛ خاوەن هۆگری و وازی ململانێ ‹ملت مبارز: گەلی خەباتکار›.

**مبارزات** / mobārezāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مبارزه**

**مبارزه** / mobāreze ، ـها؛ مبارزات/: [عربی]/اسم. خەبات؛ کێفەرات؛ ملە؛ ملانە؛ مل بە ملە؛ مل بە ملێ؛ ملەملە؛ ململانە؛ ململانێ؛ ملانێ؛ بەربەرەکانێ: ١. هەوڵ و تێکۆشانی زۆر بۆ گەیشتن بە ئامانجێک ‹مبارزه برای کسب پیروزی: خەبات بۆ سەرکەوتن› ٢. شەڕ و پێکدادان لەگەڵ دژمن یان هاوملەدا بۆ سەرکەوتن ‹مبارزەی ورزشی: ململانەی وەرزشی›.

▣ **مبارزەی انتخاباتی**: ملانەی هەڵبژاردن؛ هەوڵ و تێکۆشانی کاندیداکان پێش لە هەڵبژاردن بۆ ڕاکێشانی ڕا و دەنگی خەڵک یان لایەنگری سیاسی.

**مبارک** / mobārak/: [عربی] صفت. پیرۆز؛ موبارەک؛ موارەک؛ ممبارک؛ مارەک؛ جەخت؛ فەرخ؛ هەزەخ؛ بەفەڕ ‹روز مبارک: ڕۆژی پیرۆز›.

**مبارکباد** / mobārakbād/: [عربی/ فارسی]/اسم. پیرۆزبایی؛ مبارەکبایی؛ مبارەکبادی؛ موارەکبادی؛ ممبارکبادی؛ کاری دەربڕینی خۆشحاڵی و شادمانی لە ڕووداوێکی باش.

**مبارکی** / mobārakî/: [عربی]/اسم. ودم؛ پیرۆزی؛ یۆم؛ مبارەکی؛ موارەکی؛ ممبارەکی.

**مباشر** / mobāšer ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. ١. گزیر؛ پێشکار؛ بەردەست ٢. کارگێڕ؛ زاوت؛ وێرت؛ قورقوڕبەگ؛ کاربەدەستی ئاغا ٣. بەردەست؛ وەردەس؛ دەستیار؛ یاریدەر؛ خەلفە؛ ئاریکار.

**مباشرت** / mobāšerat ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. گزیری؛ بەردەستی ٢. کارگێڕی؛ قورقوڕبەگی ٣. ئاریکاری؛ هاوکاری؛ هاریکاری؛ هاوقۆڵی ٤. هاودەستی؛ هاوقۆڵی.

**مبال** / mabāl ، ـها/: [عربی] *[گفتاری، قدیمی]* ☜ **مستراح**

**مبالات** / mobālāt/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* وردی؛ سەرنج؛ دۆخی ئاوڕ دانەوە و ورد بوونەوە لە کردەوە و هەڵسوکەوتی خۆ.

**مبالغ** / mabāleq/: [عربی] جمعِ ☜ **مبلغ**

**مبالغات** / mobāleqāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مبالغه**

**مبالغه** / mobāleqe ، ـها؛ مبالغات/: [عربی]/اسم. زێدەڕۆیی؛ گر؛ بڤ؛ چۆنیەتی گەورەتر و زیاتر لە ڕادەی خۆی نیشان دان و باس لێ کردنی شتێ. هەروەها: **مبالغه بودن؛ مبالغه شدن؛ مبالغه کردن**

**مبانی** / mabānî/: [عربی] جمعِ ☜ **مبنا**

**مباهات** / mobāhāt/: [عربی]/اسم. شانازی؛ کار و ڕەوتی نازین؛ سەرفیرازیکردن ‹ما به فرزندان دانا و دلیر خود مباهات می‌کنیم: ئێمە بە ڕۆڵە زانا و ئازاکانمانەوە شانازی دەکەین›.

**مباهی** / mobāhî/: [عربی] صفت. *[ادبی]* سەربە رز؛ سەرفەراز؛ سەربلند.

**مبایعه** / mobāye'e/: [عربی]/اسم. *[حقوق]* دانوسان؛ مامەڵە؛ مامڵە؛ سەودا؛ کار و ڕەوتی سەندن و فرۆشتن.

**مبایعەنامه** / mobāye'enāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[حقوق]* سەودانامە؛ بەڵگەی فرۆشتن و کڕین؛ نووسراوەیێکی ڕەسمی کە فرۆشەر و کڕیار ناونیشانی جنس، کاتی وەرگرتن، نرخ، چۆن دان و وەرگرتن و مەرجەکانیتری تێدا ڕوون دەکەنەوە و لەسەری پێک دێن.

**مبایل** / mobāyl ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. موبایل؛ تەلەفۆنی بەردەست/ هاوڕێ: **موبایل**

**مباین** / mobāyen/: [عربی] صفت. *[ادبی]* ناتەبا؛

نەساز؛ ناسازگار ‹این عمل مباین اصل حسن همجواری است: ئەم کارە لەگەڵ بنەمای هاوساداریدا ناتەبایە›.

**مباینت** / mobāyenat ، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] ناتەبایی؛ نەسازی؛ ناسازگاری ‹با اصول اعتقادی ما مباینت دارد: دەگەڵ بنەمای بڕوای ئێمەدا ناتەبایی هەیە›.

**مبتدا** / mobtadā /: [عربی]/اسم. ۱. [نامتداول] دەسپێک؛ سەرەتا ۲. [دستوری] موبتەدا؛ بەشێ لە ڕستە کە لە پێشدا دێ و دوایی ڕستەکە هەواڵێکە لە بارەیەوە.

**مبتدی** / mobtadî ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. تازەکار؛ نۆدەس؛ نۆمس؛ نۆکار؛ تازەفێربووگ ‹این کارگر مبتدی است و هنوز نمی‌شود روی ماشین کار کند: ئەم کاریگەرە تازەکارە و هێشتا نابێ لە سەر ماشین کار بکا›.

**مبتذل** / mobtazal /: [عربی] صفت. سووک؛ چرووک؛ هیچ و پووچ؛ بەبێ هیچ تایبەتمەندیەکی باش و بە کەڵک و بەرچاو ‹رفتار مبتذل: ئاکاری سووک›.

**مبتکر** / mobtaker ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. داهێنەر؛ نۆهێن؛ نۆهێنەر ‹آرام صنعتگری مبتکر و خلاق است: ئارام پیشەسازێکی داهێنەر و خولقێنەرە›.

**مبتلا** / mobtalā ، ـها؛ ـیان/: [عربی] صفت. تووشیار؛ دووچار؛ ئاڵفتە ‹او هم بە بیماری سل مبتلا شدە بود: ئەویش تووشیاری دەردە باریکە ببوو›.

**مبتلابه** / mobtalābeh /: [عربی] صفت. دەسەویەخە؛ هۆی دەردیسەر.

**مبتنی** / mobtanî /: [عربی] صفت. دامەزراو؛ بنەڕەتنراو؛ لە سەر شتێک ڕاگیراو ‹این نتیجەگیری شما مبتنی بر چە اصلی است؟: ئەم ئاکامەی ئێوە لە سەر چ بنەمایێک دامەزراوە ؟›.

**مبحث** / mabhas ، ـها؛ مباحث/: [عربی]/اسم. بابەت؛ مەبەستی باس؛ ئەوەی باسی لە سەر دەکرێ.

**مبدأ** / mabda' ، ـها؛ مبادی/: [عربی]/اسم. سەرەتا؛ دەسپێک.

▣ **مبدأ تاریخ**: سەرەتای مێژوو؛ دەسپێکی مێژوو؛ ئەو کاتە کە مێژوو لەوێوەڕا دەژمێرن ‹مبدا تاریخ میلادی، تولد عیسی پیامبر است: سەرەتای مێژووی زایینی لە دایک بوونی عیسای پێغەمبەرە›.

**مبدل** / mobaddal /: [عربی] صفت. گۆڕاو؛ گۆڕدراو ‹لباس مبدل: جلی گۆڕاو›.

▣ **مبدل شدن**: بوون؛ گۆڕدران؛ گۆڕان؛ گۆڕیان؛ کران؛ ئاڵوگۆڕ بە سەر هاتن ‹اینک آنجا بە پارک مبدل شدە است: ئێستا ئەوێ بووە بە پارک›.

**مبدل** / mobaddel /: [عربی]/اسم. ئاداپتۆر؛ ئامرازی گۆڕانی ڤۆڵتاژی کارەبا.

**مبذول** / mabzûl /: [عربی] صفت. دانراو؛ بەکار چوو؛ تەرخانکراو.

▣ **مبذول شدن**: دران؛ نران؛ کران؛ بە کار چوون؛ تەرخان کران/ دران ‹باید بە این منطقە توجە زیادی مبذول شود: بەم ناوچەیە دەبێ سەرنجێکی زۆرتر بدرێت›.

**مبرا** / mobarrā /: [عربی] صفت. بەدوور؛ دوور؛ بەری؛ پاک ‹او از این گناهی مبراست: لەم تاوانە بەدوورە›.

**مبرات** / mabarrāt /: [عربی]/اسم. چاکە؛ خاسە؛ خاسی؛ کارگەلی چاک.

**مبرد**[1] / mobarred /: [عربی]/اسم. ساردکەرەوە: ۱. تراوێک لە دەزگاگەلی ساردکەرەوەدا کە کاتی هەڵماندن گەرما دەگرێ و لە دڵۆپاندندا گەرماکە دەداتەوە ۲. فێنککەرەوە؛ دەوا یان خۆراکێ کە لەش فێنک دەکاتەوە.

**مبرد**[2]: صفت. ۱. ساردکەرەوە ۲. فێنککەرەوە.

**مبرز** / mabraz /: [عربی] [قدیمی] ☜ **مستراح**

**مبرز** / mobarrez, mobarraz /: [عربی] صفت.

هەڵکەوتوو؛ هەڵکەوتە؛ هەویاز؛ هەڤیاز؛ بەرچاو؛ لەبەرچاو ‹او نویسندەای مبرز بود: نووسەرێکی هەڵکەوتوو بوو›.

**مبرم** / mobram/: [عربی] *صفت*. ۱. بەردەوام؛ پێداگر ‹تلاش مبرم: تێکۆشانی بەردەوام› ۲. زۆر؛ فرە؛ فراوان ‹توجه مبرم: سەرنجی زۆر›.

**مبروص** / mabrûs/: [عربی] *صفت*. بەڵەکی؛ تووشیاری نەخۆشی پیسی.

**مبرهن** / mobarhan/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* روون؛ ئاشکرا؛ دیار؛ خویا.

**مبسوط** / mabsût/: [عربی] *صفت*. بەربلاو؛ بەرئاوەلا؛ کراوە ‹شرح مبسوط: شرۆڤەی بەربلاو›.

**مبشر** / mobašŝer، ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* مزگێنیدەر؛ مزانیدەر؛ مژدانەهێن؛ کەسێ کە هەواڵێکی خۆش بێنێت.

**مبصر** / mobser، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم*. سەرپۆل؛ قوتابییەک لە هەر پۆلدا کە بەرپرسی ڕێکوپێکی و ئارامی پۆلەکەیەتی.

**مبطل** / mobtel، ـات/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* بەتاڵکەرەوە؛ پووچەڵکەرەوە؛ هەڵوەشێنەر.

**مبعث** / mab'as/: [عربی] *اسم*. ۱. زەمانی هەڵبژێران و ناردران ۲. شوێنی هەڵبژێران و ناردران ۳. ☜ عید مبعث، **عید**

**مبعوث** / mab'ûs/: [عربی] *صفت*. نێردراو؛ ناردراو؛ ناریاگ؛ هەناریاگ.

**مبغوض** / mabqûz، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* بەرکین؛ بەر رق؛ بەرقین؛ قین لێ هەڵگیراو؛ وەبەر قینکەوتوو؛ وەبەر تووڕەیی یان دژمەنایەتی کەوتوو.

**مبل** / mobl، ـها/: [فرانسوی] *اسم*. موبل؛ قەنەفە؛ جۆرێک سەندەڵی ڕاحەت بە دۆشەکی نەرمی فەنەردار و دەسکی چێو یان لە هەور و پووشاڵ.

**مبل سازی** / moblsāzî/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم*. موبل سازی: ۱. کاری دروستکردنی موبل ۲. /ـها/ کارگەی دروستکردنی موبل.

هەروەها: **مبل‌ساز**

**مبلغ** / mablaq، ـها؛ مبالغ/: [عربی] *اسم*. بڕ؛ هەند؛ کرت؛ ئەندازەیێک لە دراو ‹مبلغ یک میلیون: بڕی ملیۆنێک›.

**مبلغ** / moballeq، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم*. ۱. بانگەشەکار؛ بانگێشتنکەر؛ ئەوەی بە قازانجی بیر و بڕوا، ڕێکخراوە یان کەسێک، قسە و بانگهێشتن دەکا ۲. *[قدیمی]* ڕاگەیێنەر.

**مبلمان** / moblemān/: [فرانسوی] *اسم*. کەلوپەلی پێویست بۆ ساز و تەیارکردنی شوێنێک.

▣ **مبلمان کردن** ☜ مبله کردن، **مبله**

**مبله** / moble/: [فرانسوی] *صفت*. موبلە؛ ساز و تەیار بە هەموو کەلوپەلی پێویستەوە.

▣ **مبله کردن**: موبلەکردن؛ ئامادەکردنی جێگایێک بە کەلوپەلی پێویست: **مبلمان کردن**

**مبنا** / mabnā، ـها؛ مبانی/: [عربی] *اسم*. بنەما: ۱. بنەڕەت؛ بنەوا؛ بناغە؛ پایە ‹مبنای کار: بنەمای کار› ۲. *[ریاضی]* ئەو ژمارە کە دەبێتە بنەڕەتی ژمارەنووسی ‹عدد ۱۰ مبنای عددنویسی دهدهی است: ژمارەی ۱۰ بنەمای ژمارەنووسی دەدەییە› ۳. *[ریاضی]* پایەی لوگاریتمی ژمارەیەک ‹لگاریتم ۱۰۰۰ در مبنای ۱۰ می‌شود ۳: لوگاریتمی ۱۰۰۰ لە بنەمای ۱۰دا دەبێتە ۳›.

**مبنی بر** / mabnîbar/: [عربی/ فارسی] *حرف*. ۱. بە پێی؛ لە سەر؛ لە ڕووی ۲. نیشاندەری؛ ڕاگەیێنەری ‹این گزارش مبنی بر سیل‌گرفتگی بخشی از شهر است: ئەم هەواڵە نیشاندەری بەرلافاو کەوتنی بەشێکی زۆر لە شارە›.

**مبهم** / mobham، ـات/: [عربی] *صفت*. شاش و بێش؛ شاش و وێش؛ لێڵ؛ ناڕوون ‹حرف مبهم: قسەی شاش و بێش›.

**مبهوت** / mabhût، ـان/: [عربی] *صفت*. ۱. حەپەساو؛ مات و حەیران؛ چەنگ؛ گێژ و

شێواو؛ تاساو؛ سەیوڕ ‹مبهوت آن‌همه زیبایی شده بود: حەپەساوی ئەو هەموو جوانییە ببوو› ۲. مات؛ سەرسووڕماو؛ واق‌وڕماو؛ چوارچاو؛ مەیماق؛ سەیرماو ‹از دیدن آن همه پول تا مدتی مبهوت افتاده بود: بە دیتنی ئەو هەمکە پارە تا ماوەیەک مات مابوو›. هەروەها: **مبهوت بودن؛ مبهوت شدن؛ مبهوت کردن؛ مبهوت ماندن**

**مبهی** / mobahhî/: [عربی] *صفت*. تاوەر؛ هۆی سەرهەڵدان و هێزگرتنی ئارەزووی جینسی.

**مبیع** / mabî'/: [عربی] *اسم*. پیتەوا؛ کاڵا؛ ئەوەی بۆ فرۆتن دیاریکراوە ‹مبیع یک ماه بعد بە خریدار تحویل خواهد شد: پیتەواکە مانگێک لەودوا دەدرێتە کڕیار›.

**مبین** / mobayyen/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* نیشاندەر؛ دەربڕ؛ ڕوونکەرەوە؛ بەرچاوخەر ‹خدمات استاد هژار، مبین تلاشی عظیم در راه حفظ و گسترش فرهنگ و زبان کردی بود: خزمەتەکانی مامۆستا هەژار، نیشاندەری هەوڵ و خەباتێکی گەورە بوو لە پێناوی پاراستن و پەرە پێدانی زبان و فەرهەنگی کوردیدا›.

**مبین** / mobîn/: [عربی] *صفت*. *[نامتداول]* ئاشکرا؛ ڕوون؛ دیار؛ لەبەرچاو؛ خویا.

**متابعت** / motābe'at، ـها/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* ۱. ڕاژێری؛ فەرمانبەری؛ ژێردەستەیی ‹متابعت از قانون: ڕاژێری قانوون› ۲. شوێنەڕایی؛ شوێنکەوتوویی؛ شوێگری؛ شوێنداچوویی ‹متابعت از دستور: شونەڕایی لە فەرمان›.

**متابلیسم** / metābolîsm/: [فرانسوی] *اسم*. *[زیست‌شناسی]* میتابولیسم؛ سووت و ساز؛ ڕەوتی فیزیایی و کیمیاوی ژینەوەر کە ماکی بژیوی وەردەگرێ، تێکەڵی دەکا، لێکی دەداتەوە و لە ئەنجامدا دەیکاتە وزەی ژیان: **متابولیسم**

**متابولیسم** / metābûlîsm/: [فرانسوی] ☜ **متابلیسم**

**متأثر** / mota'sser, mote'asser/: [عربی] *صفت*. ۱. شوێنەواگر؛ کارتێکراو ‹شعر شهریار متاثر از حافظ است: شیعری شەهریار شوێنەواگری حافزە› ۲. *[مجازی]* خەمین؛ ناڕەحەت؛ پەشێو؛ شەمزاو ‹از شنیدن خبر سخت متاثر شد: لە بیستنی هەواڵەکە زۆر خەمین بوو›.

**متأخر** / mota'axxer, mote'axxer، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. دوایین؛ دواوەتر؛ دواتر؛ دوائاخر؛ ئەوی دوای ئەو یان ئەوانی‌تر هاتبێ ‹عباس حقیقی از شعرای متأخر کُرد است: عەباس حەقیقی لە هۆنەرانی دواییین کوردە›.

**متأذی** / mota'azzî, mote'azzî/: [عربی] *صفت*. ئاراو؛ ئازاردیتوو؛ بەرئازار.

**متارکه** / motāreke/: [عربی] *اسم*. ۱. کار و ڕەوتی کۆتا کردن؛ دەس هەڵگرتن؛ بەجێ‌هێشتن و کۆتایی پێ هێنان ‹متارکەی جنگ: کۆتا کردنی شەڕ› ۲. *[مجازی]* جیایی؛ تەڵاق؛ ڕەوتی جیا بوونەوەی ژن و شوو لە یەکتری ‹پس از بیست سال زندگی مشترک، متارکه کردند: دوای بیست ساڵ ژیانی هاوبەشی، جیا بوونەوە›.

**متأسف** / mota'assef, mote'assef/: [عربی] *صفت*. بەداخ؛ وەداخ؛ تووشیاری ناڕەحەتی ‹از گم شدن کیف خیلی متأسف شدم: لە گوم بوونی کیفەکە زۆ بەداخ بووم›.

**متأسفانه** / mota'assefāne, mote'assefāne/: [عربی/ فارسی] *قید*. بەداخەوە؛ مخابن؛ حەیفی؛ حەیفێ؛ داخەکەم؛ دەستی‌شکاوم ‹متأسفانه دیگر کاری نمی‌شود کرد: بەداخەوە ئیدی کارێک ناکرێ›.

**متاع** / matā'، ـها؛ امتعه/: [عربی] *اسم*. *[قدیمی]* جنس؛ کەل‌وپەل؛ کاڵا؛ کووتاڵ؛ پرتاڵ.

**متافیزیک** / metāfîzîk/: [فرانسوی] *اسم*. میتافیزیک؛ ژوورەسروشت؛ ئەوی بە پێی قانوونی فیزیک ناگونجێ و شرۆڤە ناکرێ.

**متألم** / mota'allem, mote'allem/: [عربی] *صفت*. ۱. *[نامتداول]* بەژان؛ ئازرێن؛ پرێش ۲. *[مجازی]*

پـەرۆش؛ جـەرگ‌ئـاوس؛ جـەرگاوس؛ مـردووچ؛ مرووز؛ کز و خەمبار؛ خەماوی.

**متـالورژی** / metālûrjî, metālorjî/: [فرانسوی] /اسم. کانزانی؛ کانزاناسـی؛ کانزاگـەری؛ زانسـت و لێزانی دەرهێنان، پـالاوتن، ئالیاژسـازی، بـیچم پێدان و ناسینەوەی تایبەتمەندیەکانی فیزیایی، کیمیـاوی و میکـانیکی مـاکی کـانزا: **فلزگـری؛ مادەشناسی**

**متالوگرافی** / metālog(e)rāfî/: [فرانسوی] /اسم. لێکدانەوەی پێکهاتەی کانزا بە میکرۆسکۆپ.

**متألـه** / mota'alleh, mote'alleh، ـان؛ ـین/: [عربی] صـفت. ۱. خوانـاس؛ خوداشـناس ۲. کەلامی؛ شارەزا لە زانستی کەلامدا.

**متالیک** / metālîk/: [فرانسوی] صفت. میتالیـک؛ بریقەدار؛ بە بریکەی کانزاییەوە.

**متان** / metān/: [فرانسوی] /اسم. [شیمی] میتـان؛ گازی گەنکاو؛ ساکارترین هیدرۆکەربون کە بـێ ڕەنگ، بێ بـۆن و گـڕگرە و لـە گـەنینی مـاکی زیندەڵ لە گەنکاوان بەدی دێ.

**متانـت** / metānat, matānat/: [عربی] /اسم. لەسەرخۆیی؛ گەردەنیشی؛ پشوودرێژی؛ پتەوی؛ موکومی؛ سەنگینی و گرانی مرۆ.

**متانـل** / metānol/: [فرانسوی] /اسم. [شیمی] میتـانول؛ ئـەلکول میتیلیـک؛ ئـەلکولی چێـو؛ تراوێکی ژەهراوی بێ‌ڕەنگ، هەڵچووگ و گڕبەرە بە بۆنێکی کەمەوە لە دڵـۆپاندنی چێـو بەرهـەم دێ و بۆ پیشەسازی زۆری کەڵک هەیە.

**متأهـل** / mota'ahhel, mote'ahhel، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. هاوسـەردار؛ بـە هاوسـەر؛ ژن خواستوو یان شووکردوو.

**متبـادر** / motabāder, motebāder/: [عربی] صـفت. [ادبی] بەپەلـە؛ بەلـەز؛ بـە هەشـتاو؛ بـە پەلەپاتۆر؛ بەلەز و بەز.

▣ **بە ذهن متبادر شدن:** زوو هاتنەوە بیر؛ گـورج کەفتنەوە بیر.

**متبـاین** / motabāyen, motebāyen/: [عربی] صـفت. جیاواز؛ یەکنەگر؛ بە فەرقی زۆر لـە بـاری چیەتی، چۆنیەتی یان چەندێتیەوە.

**متبحـر** / motabahher, motebahher/: [عربی] صفت. پیتـۆڵ؛ لێـزان؛ ژێهـاتی؛ لـەکار و کـارزان ‹پزشک متبحر: بژیشکی پیتول›.

**متبـرک** / motabarrek, motebarrek/: [عربی] صفت. تەوەرک؛ پـیرۆز؛ موبـارەک ‹بخورید، ایـن شیرینی متبرک است: بخۆن، ئەم شیرینیە تەوەرکە›.

**متبسـم** / motabassem, motebassem/: [عربی] صفت. بە بزە؛ بە پێکەنین؛ بە خەنـە؛ بـە گـورمز؛ دەم بـە زەردەخەنـە ‹چهـرەی متبسـم: ڕوومـەتی بەبزە›.

**متبلـور** / motabalver, motebalver/: [عربی] صفت. ۱. بلووری؛ بە شـێوە و حاڵـەتی بلـوورەوە ‹دانـەهـای متبلـور: دەنکـی بلـووری› ۲. [مجـازی] دەرکەوتوو؛ وەدیهاتوو ‹گـویی انسـانیت در وجـود او متبلـور شـده بـود: دەتگـوت مرۆڤـایەتی لـەودا دەرکەوتبوو›.

**متبوع** / matbû'/: [عربی] صفت. ڕاژۆر؛ پێـڕەوی لێکراو ‹دولت متبوع: دەوڵەتی ڕاژۆر›.

**متجاسـر** / motacāser, motecāser، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. یاخی؛ سەربزێو؛ سەرکەش.

**متجـانس** / motacānes, motecānes/: [عربی] صـفت. ۱. هاوڕەگـەز؛ هـاوجنس؛ هاوجسـن ۲. هاوئاهـەنگ؛ هاوگـەر؛ ڤـێک‌هـاتی؛ بـە هاوڕێیەتی یان هاوبیریەوە.

**متجـاوز**[1] / motacāvez, motecāvez، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] /اسم. دەسـت‌درێژکـەر؛ هێرشـبەر ‹لشکر متجاوز: لەشکری دەست‌درێژکەر›.

**متجاوز**[2]: قید. زۆرتر لە؛ زیاتر لە؛ پتر لـە؛ فرەتـەر جە ‹متجاوز از صد نفر آمـده بودنـد: زۆرتـر لـە سـەد کەس هاتبوون›.

**متجدد** / motacadded, motecadded، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. نوێخواز؛ نوێـواز؛ نـۆواز؛ نـۆگر؛

نۆوەگر؛ لایەنگری تازەیی لە هەر شتێکدا.

**متجسس** / motacasses, motecasses/: [اعربی] *صفت.* ۱. شوێنگەڕ؛ شوێنگر؛ شوێنهەڵگر؛ لێگەڕ؛ بۆگەڕ؛ لە شوێن گەڕ؛ تایبەتمەندی ئەوەی کە لە شوێن کەسێ یا شتێک دەگەڕێ ۲. *[قدیمی]* شۆفار؛ شووفار؛ جاسووس.

**متجلی** / motacallî, motecallî/: [اعربی] *صفت.* ئاشکرا؛ دیار؛ ڕوون؛ خویا ‹نمونەهای بسیاری از شجاعت و فداکاری در میدانهای مبارزه متجلی شد: وێنەی زۆر لە ئازایەتی و گیانبەختکردن لە گۆڕەپانی شەڕ و خەباتدا ئاشکرا بوو›.

**متحجر** / motahaccer, motehaccer/: [اعربی] *صفت.* ۱. بەردەنی؛ بە بەردبوو؛ بەرد هەڵگەڕاو ۲. *[ان؛ ـین/[مجازی]* بیرگرساو؛ مێشکوشک؛ کۆنەپەرست؛ کۆنەواز؛ هۆگری بیر و بۆچوونی کۆن و بەرهەڵستی نوێوازی و ڕامان.

**متحد** / mottahed، ـان؛ ـین/: [اعربی] *صفت.* هەڤگر؛ یەکگر؛ یەکگرتوو؛ یەکانگیر ‹گروههای متحد: کۆمەڵە یەکگرتووەکان›.

⊡ **متحد شدن:** هەڤدوگرتن؛ یەکگرتن؛ یەکیەتی کردن؛ یەکانگیر بوون؛ یەوبینان گرەوتش ‹سرانجام باهم متحد شدند و تلاش تازەای را آغاز کردند: لە ئاکامدا یەکیان گرت و هەوڵێکی تازەیان دەست پێ کرد›. هەروەها: **متحد کردن**

**متحدالشکل** / mottahedoššekl/: [اعربی] *صفت.* یەکبیچم؛ یەکشێوە؛ هاوشێواز؛ بە بیچم و ڕواڵەتی وەک یەکەوە ‹لباسهای متحدالشکل: جلوبەرگی هاوشێواز›.

**متحدالمرکز** / mottahedolmarkaz، ـها/: [اعربی] *صفت.* هاوناوەند؛ یەکناوەند؛ هاوچەق؛ بە تاقە ناوەندێکەوە ‹دایرەهای متحدالمرکز: جەغزە هاوناوەندەکان›.

**متحده** / mottahede/: [اعربی] *صفت.* یەکگرتوو؛ یەکانگیر؛ بە یەکیەتی ‹ایالات متحده: وڵاتە یەکگرتووەکان›.

**متحرک** / motaharrek, moteharrek/: [اعربی] *صفت.* بزۆز؛ بە بزاڤ؛ بە جووڵە ‹جسم متحرک: تەنی بزۆز›.

**متحصن** / motahassen, motehassen، ـان؛ ـین/: [اعربی] *صفت.* جەنەگر؛ گەگیر؛ هەوکن؛ هۆکن؛ خەزریو ‹دانشجویان در دانشگاه متحصن شدند: خوێندکاران لە زانستگادا جەنەگر بوون›.

**متحمل** / motahammel, motehammel/: [اعربی] *صفت.* بردەبار؛ خۆڕاگر؛ هەڵگر.

⊡ **متحمل شدن:** ۱. هەڵگرتن؛ هەڵکردن؛ تاقەت هێنان ۲. لێکەوتن؛ کەوتنە سەر شان؛ دیتن ‹متحمل خسارت شدن: زیان لێکەوتن›.

**متحول** / motahavvel, motehavvel/: [اعربی] *صفت.* ئەمدیو ئەودیو؛ بارەوبار ‹در این ده سال، همه چیز متحوّل شده است: لەم دە ساڵەدا هەموو شتێ ئەمدیو ئەودیو بووە›.

**متحیر** / motahayyer, motehayyer/: [اعربی] *صفت.* مات؛ سەرسام: ۱. سەرسووڕماو؛ حەپەساو؛ واقوڕماو؛ هەوەسیاگ؛ تووشیاری سەرسووڕماوی ۲. گێژ و شێواو.

⊡ **متحیر شدن:** واقوڕمان؛ سەرسووڕمان؛ سەیرمان؛ ڕامان؛ شەرپلان؛ شەرپلین؛ ڤەتەوشین؛ سەرزڤران.

**متخاصم** / motaxāsem, motexāsem/: [اعربی] *صفت.* دژبەیەک؛ هاودژ؛ دژمەنی یەکتر؛ لێکبەقین؛ لێکدوژمن ‹نیروهای مُتخاصم: هێزە دژبەیەکەکان›.

**متخذ** / mottaxez/: [اعربی] ☜ **مُتَّخِذه**

**متخذه** / mottaxeze/: [اعربی] *صفت.* گیراو؛ وەرگیراو؛ بەدەستهاتوو: **مُتَّخذ**

**متخصص**[1] / motaxasses, motexasses، ـها؛ ـان؛ ـین/: [اعربی] *اسم.* لێزان؛ پسپۆڕ؛ کارناس ‹رفتند متخصص آوردند درستش کرد: ڕۆیشتن لێزانیان هێنا دروستی کردەوە›.

**متخصص**[٢]: صفت. لێزان؛ لەکارزان؛ پسپۆڕ؛ کارزان ‹پزشک متخصص: بژیشکی لێزان›.

**متخلخل** / motaxalxel, motexalxel/: [عربی] صفت. کون ـ کون؛ فشەڵ؛ فشۆڵ؛ فشەڵۆک؛ فشەڵە؛ گڵ؛ پفەڵ؛ کەفەڵۆک؛ تل؛ خل؛ کەفەلووک؛ کەفەلووکە؛ بە کون و هولۆلیەوە.

**متخلص** / motaxalles, motexalles/: [عربی] صفت. بەنازناو؛ نازناودار.

**متخلف** / motaxallef, motexallef ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. لاڕێ؛ سەرپێچکار؛ هەڵەکار؛ گەنەکار؛ چەوتکار؛ لە ڕێ لادەر ‹فرد متخلف مجازات خواهد شد: کەسی لاڕێ جزیا دەدرێ›.

**متخلق** / motaxalleq, motexalleq/: [عربی] صفت. [نامتداول] بە ئاکار؛ خاوەن ئاکار و ڕەوشتی چاک.

**متد** / metod ، ـها/: [فرانسوی] اسم. شێوە؛ شێواز؛ ڕەوشت.

**متداخل** / motadāxel, motedāxel/: [عربی] صفت. لە ناو یەک؛ تێوەچوو؛ تێکەوەچوو؛ تێکپەڕیو؛ بە یەکا چووگ؛ ناو یەکچوو؛ جێ گرتوو لە نێو یەکتریدا ‹اجسام متداخل: شتگەلی لە ناو یەک›.

**متداول** / motadāvel, motedāvel/: [عربی] صفت. باو؛ لەباو؛ لە سەر دەور و جێی بە کار بردن ‹سپس حمام خانگی متداول شد: پاشان حەمامی ماڵی بوو بە باو›.

**متدرجاً** / motadarrecan/: [عربی] قید. [نامتداول] بەرە ـ بەرە؛ وردە ـ وردە؛ کەمە ـ کەمە؛ کەم ـ کەم؛ وارە ـ وارە؛ شێنەی ـ شێنەی؛ نەختە ـ نەختە؛ تۆزە ـ تۆزە؛ هەر وەرێنە؛ لە بەرێکەوە ‹بدهی‌هایت را متدرجاً می‌دهی و خیالت راحت می‌شود: بەرە ـ بەرە قەرزەکانت دەدەیەوە و ئاسوودە دەبی›.

**متدولژی** / metodolojî/: [فرانسوی] اسم. ڕەوشتناسی؛ ڕەوشناسی: ١. ناسینەوەی کۆمەڵە شێواز و بنەمای دەکارکراو لە ئامۆژەیەکدا ٢. لێکدانەوە و لێڕوانینی بنەما و شێوەگەلی دەکارکراو لە بوارێکی تایبەتدا.

**متدیست** / metodîst/: [فرانسوی] اسم. میتودیست: ١. تاقمێکی مەزهەبی پرۆتستان کە لە ئینگلیز سەری هەڵدا و ئێستاش لە وڵاتانی ئینگلیزی زماندا هۆگری هەیە ٢. ـها؛ ـان/ هەر یەکە لە شوێنکەوتووانی ئەو مەزهەبە.

**متدین** / motadayyen, motedayyen ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. دیندار؛ بەدین؛ خاوەن بڕوا بە خوا و دینێکی ئاسمانی.

**متذبذب** / motazabzeb/: [عربی] صفت. بیرەبیر؛ ڕا ـ ڕا؛ وازوازی؛ دەمەدەمی؛ حولحولی؛ هۆکی؛ هۆکهۆکی؛ هەر دەم لە سەر هەوایێک.

**متذکر** / motazakker, motezakker/: [عربی] صفت. بیرهێنەر؛ وەبیرهێنەر؛ وەبیرهێن؛ بیرخەرەوە.

- ▣ **متذکر شدن**: وە بیر خستنەوە؛ بیر هێنانەوە؛ هێنانەوە یاد؛ وستەیوە هۆش ‹به ایشان متذکر شوید که باید از طریق سلسله مراتب اداری اقدام کند: وە بیریان بخەنەوە کە دەبێ لە ڕێگای زنجیرەپلەی کارگێڕیەوە هەوڵ بدەن›.

**متر** / metr/: [فرانسوی] اسم. میتر؛ مەترە: ١. یەکەی سەرەکی پێوانی درێژایی لە دەزگای میتریدا کە دەکاتە ١٠٠ سانتیمیتر ٢. ـها/ نەوارێکی باریک و پلەکلێدراو لە کانزا، قوماش و... بۆ پێوانی درێژایی.

- ▣ **متر مربع**: میتری چوارگۆش؛ یەکەی پێوانی ڕووبەر لە دەزگای میتریدا بەرامبەر بە ١٠٠٠٠ سانتیمیتری چوارگۆش.
- **متر مکعب**: میتری چوارپاڵوو؛ یەکەی پێوانی بارستایی لە دەزگای میتریدا بەرامبەر بە یەک ملیۆن سانتیمیتری چوارپاڵوو.
- ▣ **متر کردن**: پێوان؛ میترکردن؛ گەزکردن؛ گەز کەردەی؛ درێژی یان پانتایەک پێوان.

**مترادف** / motarādef, moterādef/: [عربی]

صفت. ۱. هاوڕز؛ هاوڕزن؛ هاوڕیز؛ ریزهەڤ؛ لە یەک ڕیزدا ۲. /ـها/ هاووەتا؛ هاومانا (وەک «ماڵ» و «خانوو»).

**متراژ** / metrāj ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. میتراژ: ۱. ئەندازە؛ ئەنازە؛ گۆرەبا ‹متراژ پارچە: ئەندازەی قوماش› ۲. ڕووبەر؛ پانتایی؛ بەر ‹متراژ زمین: ڕووبەری زەوی›.

**متراکم** / motarākem, moterākem/: [عربی] صفت. چڕ؛ سخ؛ پڕ؛ چڕەبەند؛ لێک‌گلۆف؛ لێک‌پەستاو؛ پەسمەن؛ تێک‌هەڕستوو؛ بەهەمەت.

**مترتب** / motaratteb, moteratteb/: [عربی] صفت. دوادار؛ شوێنەواردار؛ بە دوا هاتەوە.

▣ مترتب بودن: ئاکام بوون؛ بە دواوە بوون؛ ئاکامدار بوون؛ دوادار بوون؛ بە شوێنەوە بوون ‹به این تلاش تو فایده‌ای مترتب نیست: ئەم هەوڵدانەی تۆ ناکامیکی نیە›. هەروەها: **مترتب شدن**

**مترجم** / motarcem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. وەرگێر: ۱. چێورکار؛ بەرچڤەکار؛ بەرچڤان؛ پاچڤان؛ پاجڤەکار؛ پاچڤەکار؛ دیلمان؛ دیلماج؛ دیلبەند؛ ئەوەی بابەتێک لە زمانێکەوە وەردەگێڕێتەوە سەر زمانێکی تر ‹مترجم انگلیسی: وەرگێری ئینگلیزی› ۲. [مجازی] نیشاندەر؛ ڕوونکەرەوە؛ ئەوەی مەبەست و مەرای کەس یان کەسانێک بۆ خەڵک دەگێڕێتەوە ‹او در این سخن مترجم احساسات بسیاری از مردم است: ئەو لەم قسەیەدا وەرگێری هەست و نەستی زۆرێک لە خەڵکە›.

**مترجمی** / motarcemî/: [عربی]/اسم. پاچڤەکاری؛ وەرگێری؛ دیلمانجی: ۱. کاری وەرگێران ۲. کار و پیشەی وەرگێر.

**متردد** / motaradded, moteradded/: [عربی] صفت. دوودڵ؛ ناخاترجەم؛ بە گومان؛ دڕدۆنگ؛ دەردۆک؛ هەردەبیر.

**مترس** / metres ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. قەپاتمە؛ سووتلی؛ ماشۆقە؛ ژنێ کە دەگەڵ پیاوێکدا تێکەڵی جینسی ناڕەوای هەیە.

**مترسک** / matarsak ، ـها/:/اسم. ۱. قەیلۆک؛ داهۆڵ؛ داوەڵ؛ داوەڵە؛ داوول؛ دوول؛ داوڵ؛ داورە؛ دلۆ؛ دالاهۆ؛ دالهۆ؛ دالۆ؛ داڵەهۆ؛ چاتۆڵ؛ هەراسە؛ هەلامەت؛ مەترەس؛ سەرەکەر؛ لۆپک؛ پەیکەرەی لە پووش و پەلاش لە مەزرا بۆ ترساندنی باڵندە و... ۲. [مجازی] خوێری؛ مرۆی سەپۆل و بێدەسەلات ۳. [مجازی] بم؛ ترچماق؛ مەندەبۆر؛ مەندەبوور؛ ناشیرین و ڕەزاگران.

**مترشح** / motaraššeh, moteraššeh/: [عربی] صفت. بدەڵێن؛ دەڵێنەر؛ دادەر.

**مترصد** / motarassed, moterassed/: [عربی] صفت. وازر؛ ئامادە؛ گوێ‌قولاخ؛ وەنگەگۆش؛ لە سەر هەست؛ بەفتراق؛ خۆ مات‌داو ‹او مترصد بود من بروم تا جایم را بگیرد: وازر بوو من بڕۆم و جێم بگرێتەوە›.

**مترقب** / motaraqqeb, moteraqqeb/: [عربی] صفت. چاوەڕوان‌کراو؛ جێی چاوەڕوانی؛ تایبەتمەندی شتێ کە زووتر ئەگەری ڕوودانی بووبێ: **مترقبه**

**مترقبه** / motaraqqebe, moteraqqebe/: [عربی] ☜ **مترقب**

**مترقی** / motaraqqî, moteraqqî/: [عربی] صفت. ۱. پێشکەوتوو؛ لە پێشەوە ‹کشورهای مترقی: وڵاتە پێشکەوتووەکان› ۲. پێشڕەو؛ پێشکەوتن‌خواز؛ هۆگری بەرەو پێش چوون ‹افکار مترقی: بیر و ڕای پێشڕەو›.

**مترو** / metro/: [فرانسوی]/اسم. میترۆ؛ قەتاری ژێرزەوی.

**مترور** / metror ، ـها/: [؟]/اسم. ۱. ڕووپێو؛ گەزکەر؛ کەسێ کە کاری پێوان و گەزکردنە ۲. ئەوەی هەندی شمەک و پێداویستی کارێک دیاری دەکا.

**متروک** / matrûk /: [عربی] *صفت.* چۆڵ؛ چووڵ؛ وێڵـه؛ چـۆڵ و وێـڵ؛ بـەجێهێڵـراو؛ دەستلێهەڵگیراو؛ واز لـێهێنـراو؛ دەسئازیـا؛ دەسلێبەردراو؛ تەرککراو؛ مارزیای؛ ڤـەهێلای ‹خانەی متروک: مالی چۆڵ›: **متروکه**

**متروکه** / matrûke /: [عربی] ☜ **متروک**

**مترولـــژی** / metrolojî /: [فرانسـوی] *اسم.* ئەندازەناسـی؛ زانسـتی ناسـینی پێوانەگـەلی فیزیکی.

**متـــرون** / metron ، ـهـا /: [انگلیسـی] *اسم.* سەرپەرسـتار؛ چاوەدێـڕ و سەرپەرشـتی پەرستارانی نەخۆشخانەیەک.

**متـرونم** / metronom ، ـهـا /: [فرانسـوی] *اسم.* *[موسیقی]* میترونـوم؛ ئـامرازی پێـوانی کـات، بـه پاژگەلی بۆ دانراوی یەک لە دوو یەک.

**متـری**[1] / metrî /: [فرانسـوی] *صـفت.* میتـری؛ پێوەندیدار بە میترەوە.

**متـری**[2]: *قید.* میتـری: ١. میتـرێ؛ میترێـک؛ میترێو؛ میتریە؛ هەر میتـرێ ‹متـری هـزار تومـان است: میتری هەزار تمەنە› ٢. بە میتر؛ بە شێوەی میتری ‹پارچه را متری مـی‌فروشـند: پارچـە میتـری دەفرۆشن›.

**ـ متری**[3]: *پیوازه.* ـ میتـری؛ بـە ڕەهەندێکـەوە (درێژای؛ پانی؛ قوولی یـا بـەرزی) بـە پێـی میتـر ‹کوچەی شش متری: کۆلانی شەش میتری›.

**متزلـزل** / motazalzel, motezalzel /: [عربـی] *صـفت.* لـەرزۆک: ١. لـەرزان؛ شـڵوشـەویق ٢. ناپتەو؛ سست.

**متساوی** / motasāvî, motesāvî /: [عربی] *صفت.* بەرابـەر؛ بەرامبـەر؛ بەرانبـەر؛ وەکیـەک؛ چونیەک؛ یەکسان؛ بە ئەندازەی یەک.

**متســـاوی‌الاضـــلاع** / motasāviyol'azlā', motesāvî- /: [عربی] *صفت.* لایەکسان؛ لقیەکسان؛ بە باڵ یان پاڵووی بەرامبەرەوە.

**متســاوی‌الزوایــا** / motasāviyozzavāyā, motesāvî- /: [عربـی] *صـفت.* هـەڤقـۆزی؛ هەڤکونجی؛ سـووچیەکسـان؛ بـە گۆشـەگەلی یەک ئەندازەوە.

**متســـاوی‌الســاقین** / motasāviyossāqeyn, motesāvî- /: [عربـی] *صـفت.* دوو لـق/ لاسـک یەکسان؛ بە دوو باڵی بەرامبەر و وەکیەکەوە.

**متســاوی‌الســطوح** / motasāviyossutûh, motesāvî- /: [عربـی] *صـفت.* ڕووبـەر یەکسـان؛ ڕوویەکسان؛ بە ڕووبەری هاوتاوە.

**متسع** / mottase' /: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* کراوە.

**متشــابه** / motašābeh, motešābeh /: [عربـی] *صـفت.* هاوچەشـن؛ هـەڤجـوورە؛ هاوشـێوە؛ هامشێوە: ١. وەکوو یەک؛ چوون‌یەک؛ وێکچوو؛ وەکیەک؛ یەکسان ٢. وێکچوو لـە خوێندنـەوە یان مانادا.

**متشبث** / motašabbes, motešabbes /: [عربـی] *صـفت.* دەسـەودامێن؛ دەسـەوداوێن؛ دەس بـە داوێن؛ ئاوێزان ‹به این و آن متشبث شد تـا بـه سر کارش برگردد: دەسەودامێنـی ئەم و ئەو بوو بەشـکوو بگەڕێتەوە سەر کارەکەی›.

▣ **متشبث شدن**: دەس بە داوێـن/ دەسـەودامێن بوون؛ پەلکوتان.

**متشتت** / motašattet, motešattet /: [عربی] *صفت.* ١. پەرژ و بلاو ٢. پەرێشان؛ ئالۆز؛ شێواو.

**متشـخص** / motašaxxes, motešaxxes ، ـهـا /: [عربـی] *صـفت.* ١. لەسـەرخۆ؛ مەنـد؛ خـاوەن کەسـایەتی ٢. *[مجـازی]* هێـژا؛ هەڵـکەوتوو؛ هەڵکەوتە؛ شیاوی ڕێز.

**متشرع** / motašarre', motešarre' ، ـها؛ ـان؛ ـین /: [عربـی] *صـفت.* ١. دینـدار؛ شـوێنکەوتووی شەریعەت ٢. شۆنەڕای ڕێبازی موتەشەررێعە.

**متشـرعه** / motašarre'e, motešarre'e /: [عربـی] *اسم.* موتەشەررێعە؛ ڕێبازێکە لە فیقهـی شـێعەدا کە هۆگرانی لە سـەردەمی قاجـاڕدا خۆیـان بـە شۆنەڕای ڕاستەقینەی شەریعەت دەزانی و دژی

شەیخییە سەریان هەڵدا.

**متشکر** / motašakker, motešakker/: [عربی] *صفت*. پێزان؛ ئەمەکدار؛ سوپاس‌گوزار؛ بەسپاس؛ قەدرزان.

**متشکل** / motašakkel, motešakkel/: [عربی] *صفت*. ڕێکخراو؛ پێکهاتوو؛ ڕێک و تەکووز؛ بەدام و دەزگا ‹نیروهای متشکل: هێزە پێکهاتووەکان›.

**متشنج** / motašannec, motešannec/: [عربی] *صفت*. ۱. شێواو؛ شێویاگ؛ شپرزە ۲. ئاڵۆز؛ کڕک؛ تێکەڵ ـ پێکەڵ؛ بێ‌سەرە و بەرە؛ هەڤدەل ‹جلسه متشنج شد: دانیشتنەکە ئالوزا›.

**متصاعد** / motasā'ed, motesā'ed/: [عربی] *صفت*. هەڵچوو؛ تایبەتمەندی شتێ کە هەر بەرەو سەر بچێ ‹گاز متصاعد: گازی هەڵچوو›.

**متصدی** / motasaddî, motesaddî، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم*. بەرپرس؛ کاربەدەست؛ ئەوەی کارێکی لە ئەستۆدایە ‹متصدی فروشگاه حضور نداشت: بەرپرسی فرۆشگاکە نەبوو›.

**متصرف** / motasarref, motesarref، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت*. داگیرکەر؛ داوڕکەر.

▣ متصرف شدن: بردن؛ داگیرکردن؛ داوڕکردن؛ زەوت کردن؛ لەهاندن؛ پێ‌بەرکرن؛ برینە بەر خۆوە؛ دەست بە سەردا گرتن ‹خانه را هم پسر بزرگتر متصرف شد: ماڵەکەش کوڕە گەورەکە بردی›.

**متصرفات** / motasarrefāt, motesarrefāt/: [عربی]/*اسم*. ۱. جمعِ ☜ **متصرفه** ۲. داگیرکراوان؛ داوڕکراوگەل؛ ئەو زەویانەی لە لایەن دەوڵەتێکی ترەوە داگیرکراوە.

**متصرفه** / motasarrefe, motesarrefe، ـها، متصرفات/: [عربی] *صفت*. داگیرکراو؛ داگیرکریاگ؛ داگیری؛ داوڕکراو؛ دەست بە سەردا گیراو.

**متصف** / mottasef/: [عربی] *صفت*. ناسراو؛ بە دانستە؛ خاوەن تایبەتمەندی؛ خاوەن خوو یا ئاکارێ ‹او متصف به شجاعت بود: بە ئازایەتی و بوێری ناسراو بوو›.

**متصل** [1] / mottasel/: [عربی] *صفت*. لکاو؛ چەسپاو؛ یەکگرتوو؛ نەبڕی؛ بێ‌نێوبڕ؛ بەردەوام.

▣ **متصل شدن**: یەک‌گرتنەوە؛ یەک‌گرتن؛ (پێوە)لکان؛ لکای؛ پێ‌گەیشتن ‹قصرشیرین و خانقین از طریق جاده‌ی خسروی به هم متصل شدند: قەسرشیرین و خانەقین بە ڕێگای خوسرەویدا یەکیان گرتەوە›. هەروەها: **متصل بودن؛ متصل کردن**

**متصل** [2]: *قید*. *[گفتاری]* بەردەوام؛ پەساپەس؛ پەسا ـ پەسا؛ پەیتا ـ پەیتا؛ هەیتە ـ هەیتە؛ هەیتاـهەیتا؛ بێ‌بڕانەوە ‹متصل می‌گفت، به خدا تقصیر من نبوده: بەردەوام دەیکوت بەخوا خەتای من نەبووە›.

**متصور** / motasavver, motesavver/: [عربی] *صفت*. بەرگومان؛ بەرچاو؛ ڕێ‌تێ‌چوو ‹هیچ مزیتی بر این کار متصور نیست: هیچ سەرتریەک لەم کارەدا بەرگومان نیە›.

**متصوف** / motasavvef, motesavvef، ـان/: [عربی] *صفت*. سۆفیلکە؛ خۆ بە سۆفی زان؛ مایل بە سۆفیگەری.

**متضاد** / motazād(d), motezād(d)، ـها/: [عربی] *صفت*. دژبەر؛ ناتەبا؛ دژی یەکتری ‹چنان فکرهای متضادی به ذهنش می‌رسید که قدرت تصمیم‌گیری را از او می‌گرفت: بیری دژبەری وای بە مێشکدا دەهات کە برستی بڕیاردانی لێ دەبڕی›.

**متضرر** / motazarrer, motezarrer/: [عربی] *صفت*. زەرەرلێ‌کەتوو؛ زەرەرکردە؛ زەرەردیتوو؛ زیان‌دیتوو؛ زیان‌کەفتە ‹در آن معامله خیلی متضرر شدیم: لەو سەودایەدا زۆرمان زەرەر لێ‌کەوت›.

**متضمن** / motazammen, motezammen/: [عربی] *صفت*. داگر؛ لەبەرگر؛ لە خۆگر؛ ڕەوتی گرتنەوە ‹این معامله متضمن سود شما هم هست: ئەم سەودایە قازانجی ئێوەش دەگرێتەوە›.

**متظاهر** / motazāher, motezāher، ـها؛ ـان:

ـین/: [عربی] *صفت*. خۆنوێن؛ خۆنما؛ خۆنیشاندەر؛ ڕواڵەت‌کار؛ ڕواڵەتی؛ خۆڕانوێن؛ وێژرمان ‹آدم متظاهر در همه‌جا هست جز در جایی که زحمت یا خطری باشد: مرۆڤی خۆنوێن لە هەموو شوێنێکدا هەیە مەگەر لە جێگایێ کە زەحمەت یان مەترسیەکی تێدا هەبێ›.

**متظلم** / motazallem, motezallem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/*اسم*. داوخواز؛ خوازیاری پێڕاگەیشتن.

**متعادل** / mota'ādel, mote'ādel/: [عربی] *صفت*. هاوسەنگ؛ هاوکێش؛ داربەدار؛ چۆبەچۆ؛ هاوتەوراز؛ ناوەنجی ‹باید دخل و خرجت را متعادل کنی: دەبێ دەخڵ و خەرجت هاوسەنگ بکەی›.

**متعارف** / mota'āraf, mota'āref, mote'āref/: [عربی] *صفت*. ۱. *[نامتداول]* ناسراو؛ ئەژناسیا ۲. باو؛ ڕست؛ بەبرەو ‹اصول متعارف: بنەماگەلی باو›.

**متعارفی** / mota'ārafî, mota'ārefî, mote'ārefî/: [عربی] *صفت*. ئاسایی؛ باو؛ عادی.

**متعاقب** / mota'āqebe, mote'āqebe/: [عربی] *حرف*. دوای؛ لە دوای؛ بە دوای؛ بە شوێنی؛ پاشی؛ پاش لە؛ شۆنۆ ‹متعاقب آن نامه‌ای به دستم رسید: دوای ئەوە نامەیێکم بۆ هات›.

**متعاقباً** / mota'āqeban, mote'āqeban/: [عربی] *قید*. پاشان؛ لە پاشان؛ لە دواییدا؛ دوایی؛ دمایی؛ دواخری؛ دواجار؛ ئیمجا ‹متعاقبا پلیس آمد و سه نفر را دستگیر کرد: پاشان پولیس هات و سێ کەسی گرت›.

**متعال** / mota'āl, mote'āl/: [عربی] *صفت*. پایەبەرز؛ بەرزەناو؛ پایەبلند؛ بالادەس ‹خداوند متعال: خوای پایەبەرز›.

**متعالی** / mota'ālî, mote'ālî/: [عربی] *صفت*. بەرز؛ خاوەن هەڤیازی و سەرتری ‹جایگاه متعالی: شوێنەواری بەرز›.

**متعامل**[1] / mota'āmel, mote'āmel ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/*اسم*. مامڵەگەر؛ سەوداگەر؛ سەوداکار؛ هەر کام لەو کەسانەی پێکەوە سەودا دەکەن (سەنیار یا فرۆشەر).

**متعامل**[2]: *صفت*. هاوکرد؛ بە کار و کاردانەوەی دوولایەنەوە.

**متعجب** / mota'acceb, mote'acceb/: [عربی] *صفت*. سەرسووڕماو؛ چەنگ؛ سەرسام؛ هاج ـ واج؛ جارەو ‹از حرف من متعجب شد: لە قسەکەم سەری سوور ما›.

**متعدد** / mota'added, mote'added/: [عربی] *صفت*. زۆر؛ فرە؛ بە ئەژمارێکی بەرچاوەوە ‹کتاب‌های متعدد: کتێبی زۆر›.

**متعدی** / mota'addî, mote'addî/: [عربی] *صفت*. ۱. /ـها؛ ـان/ دەس‌درێژکەر؛ هەڵەمارکەر؛ پەلاماردەر ‹از او به عنوان متعدی به زمین‌های عمومی شکایت شده است: وەک دەس‌درێژکەر بۆ زەویگەلی گشتی شکاتی لێ کراوە› ۲. ☜ فعل متعدی، **فعل**

**متعذر** / mota'azzer, mote'azzer/: [عربی] *صفت*. ۱. /ـان؛ ـین/ دەستەودامێن؛ عوزرهێنەر ۲. ئاستەم؛ یەکجار دژوار؛ زۆر سەخت و تەنانەت نزیک بە مەحاڵ ‹تأمین چنین پولی متعذر است: دابینی پارەی وا ئاستەمە›.

**متعرض** / mota'arrez, mote'arrez/: [عربی] *صفت*. ۱. /ـان؛ ـین/ *[مجازی]* پەلاماردەر؛ دەسدرێژکەر ۲. دەربڕ؛ بێژەر؛ نیشاندەر؛ وەبیرهێنەر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە شتێک نیشان دەدا یا ڕوونی دەکاتەوە ‹باید متعرض این نکته هم بشوم...: دەبێ دەربڕی ئەم خاڵەش ببم...›.

**متعصب** / mota'asseb, mote'asseb ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. پێ‌چەقێن؛ پێداگر؛ دەمارگر.

**متعظ** / motta'ez ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* گوێ‌بیس؛ پەندگر؛ قسەبیس؛ نەسیحەت‌گر؛ گۆش‌گیر؛ تایبەتمەندی کەسێ کە ئەزموون وەردەگرێ و قسەی چاکی بە گوێدا دەچێ.

**متعفن** / mota'affen, mote'affen/: [عربی]

صفت. بۆگەن؛ بۆگەنە.

**متعلق** / mota'alleq, mote'alleq/: [عربی] صفت. پێوەندیدار؛ بەندیوار؛ بەسراو؛ سەر بە شتێ یان کەسێ.

⊡ متعلق به کسی بودن: هی/ ئی کەسێ بوون؛ سەر بە کەسێ بوون؛ پێوەندیدار بە کەسێکەوە بوون؛ هینوو یۆی بیەی ‹این خانه متعلق به آزاد است: ئەم ماڵە هی ئازادە›.

**متعلقات** / mota'alleqāt, mote'alleqāt/: [عربی] اسم. پاشکۆ؛ کۆمەڵێک شتی سەر بە یەک دەزگا.

**متعلقه** / mota'alleqe, mote'alleqe/: [عربی] اسم. [مجازی، قدیمی] حەلال؛ ژنی مێرد؛ هاوسەری پیاو؛ خێزان؛ ژن؛ ژەنی ‹متعلقەی حاج تقی: حەلالی حاجی تەقی›.

**متعلم** / mota'allem, mote'allem، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. قوتابی؛ خەریک بە فێر بوونی زانستێک.

**متعه** / mot'e، ـها/: [عربی] اسم. [شیعه] ژنی ماوەیی؛ ژنێ کە بۆ ماوەیەک دەبێتە هاوسەری پیاوێک.

**متعهد** / mota'ahhed, mote'ahhed، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. بەڵێندەر؛ بەڵێندار؛ (وە)ئەستۆگر؛ بەرعۆدە؛ دەستەبەر؛ قەخۆگرتی؛ قەباڵ؛ بڕیار لە سەر لە بەرامبەر کەسیتروەوە.

**متعین** / mota'ayyen, mote'ayyen، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. بە بڕشت؛ بڕدار؛ ساماندار و خاوەن پلە و پایەی بەرزی کۆمەڵایەتی.

**متغیر**[1] / motaqayyer, moteqayyer، ـها/: [عربی] اسم. [ریاضی] گۆڕەک: ۱. ئەندازەیەکی دیاری‌نەکراو کە بشێ لە جێی خۆیدا هەر ژمارەیەکی پێ بدرێ ۲. نیشانەی داندراو بۆ وەها شتێک (وەک: x، y و…).

**متغیر**[2]: صفت. ۱. دۆخی گۆڕان ‹رنگش متغیر شد: ڕەنگی گـورا› ۲. تێکچوو؛ هەڵچوو؛ سوورهەڵگەڕاو ‹از شنیدن این خبر متغیر شد: بە بیستنی ئەو هەواڵە تێکچوو›.

**متفاوت** / motafāvet, motefāvet/: [عربی] صفت. جیاواز؛ جیاکار ‹رنگ متفاوت: ڕەنگی جیاواز›.

**متفرعن** / motafar'en, motefar'en، ـان/: [عربی] صفت. بە فیز؛ بە دەعیە؛ فیزن؛ دەماراوی؛ لووتبەرزانە ‹رفتاری متفرعن و صدایی خشن داشت: کردەوەیەکی بە فیز و دەنگێکی دڕی هەبوو›.

**متفرق** / motafarreq, motefarreq/: [عربی] صفت. پەخش و پەلا؛ دانگۆ؛ جیا-جیا؛ بڵاو؛ پرژ و بڵاو؛ پەرتەوازە؛ لێک‌جیا؛ هاویر؛ لێکدوور ‹همین که پلیس آمد متفرق شدند: هەر پولیس هات پەخش و پەلا بوون›.

**متفرقه** / motafarreqe, motefarreqe/: [عربی] صفت. ۱. بەبێ بەندیواری بە هیچ تاقم، دەستە یان ڕێکخراوەیەکی ئەوتۆ ۲. ـها/ [مجازی] نافەرمی؛ نارەسمی.

**متفق** / mottafeq، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. یەکگرتوو؛ هاودەست؛ هاوڕێ ‹همه در این عقیده متفق بودیم: گشت لە سەر ئەم باوەڕە یەکگرتوو بووین›.

**متفقاً** / mottafeqan/: [عربی] قید. وێکڕا؛ پێکەوە؛ پێکڕا؛ تێکڕا؛ وێڕا؛ پێڕا؛ بە گشتی؛ پێوە؛ یۆوە؛ بە یەکەوە ‹متفقاً رفتیم: وێکڕا چووین›.

**متفق الرأی** / mottafeqorra'y/: [عربی] صفت. هاوڕا؛ یەکدەنگ؛ هاودەنگ ‹در مورد ضرورت این بحث همه متفق‌الرأی بودند: لە سەر پێویستی ئەم باسە گشت هاودەنگ بوون›.

**متفق‌القول**[1] / mottafeqolqowl, -qo:l/: [عربی] صفت. هاوقسە؛ هاودەنگ؛ یەکقسە ‹همه متفق‌القول بودند که او دزدی نکرده است: گشت هاوقسە بوون کە ئەو دزی نەکردووە›.

**متفق‌القول**[2]: قید. یەکدەنگ؛ یەکزمان؛ یەکقسە ‹همه متفق‌القول گفتند او دزد نیست: گشت

یەکدەنگ گوتیان ئەو بێت و دز نیە›.

**متفکـر** / motafakker, motefakker ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.* ١. بیرمەنـد ‹سهروردی متفکر کُرد: سـوورەبەردی بیرمەنـدی کـورد› ٢. *[مجـازی]* نیگەران؛ پەرۆش؛ پەرێشان؛ شەوشان ‹چهـره‌اش حالت متفکر داشت: دەموچـاوی حالـەتی پەریشانـی هەبوو›.

**متقابل** / motaqābel, moteqbel: [عربی] *صفت.* ١. بەرامبـەر؛ ڕووبـەڕوو؛ ڕوولـەڕوو ‹پنجـره‌هـای متقابل: دەلاقەگەلی بەرامبەر› ٢. هەڤبەر؛ خـاوەن هەڤبەری ‹تأثیر متقابل: کاردانەوەی هەڤبەر›.

**متقابلاً** / motaqābelan, moteqābelan: [عربـی] *قیـد.* لـە وەرامـدا؛ لـە بەرامبـەردا ‹متقـابلاً او هـم لبخندی زد: لە وەرامدا ئەویش بزەیەکی کرد›.

**متقــارب** / motaqāreb, moteqāreb: [عربـی] *صفت.* هەڤگر؛ لە پەنا یەک؛ نزیک بە یەک.

**متقــارن** / motaqāren, moteqāren: [عربـی] *صفت.* ١. هاوکات؛ هاوزەمـەن؛ هاوچـاخ ‹متقـارن تابستان مـدارس تعطیـل مـی‌شـود: هاوکاتـی هـاوین قوتابخانەکان دادەخرێن› ٢. *[ریاضـی]* دەقـاودەق؛ دۆخی دوو یـان چەنـد بـیچم کـە ڕاسـت وەک یەک بێنەوە.

**متقاضــی** / motaqāzî, moteqāzî ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* خوازیار؛ داواکار.

**متقاطع** / motaqāte', moteqāte': [عربی] *صفت.* یەکبڕ.

**متقاعد** / motaqā'ed, moteqā'ed: [عربی] *صفت.* ١. ڕازی؛ ساز ‹سرانجام او را به رفتن متقاعد کردم: لە ئاکامـدا ڕازیم کـرد بـڕوا› ٢. *[قـدیمی]* وەنیشـتە؛ کارکەنار؛ لەکارتە؛ خانەنشین.

**متقال** / metqāl ☜ **مدقال**

**متقبـل** / motaqabbel, moteqabbel: [عربـی] *صـفت.* وە ئەسـتۆگر؛ وەرگـر؛ پـەزێرا ‹هزینـه‌ی بیمارسـتان را متقبـل شـد: خـەرجی بیمارسـتانی وە ئەستۆ گرت›.

**متقدم** / motaqaddem, moteqaddem: [عربی] *صـفت.* ١. *[نامتـداول]* پێشـقەدەم؛ پێشـاهەنگ؛ پێشـڕۆ ٢. /ـان؛ ـین/ پێشـین؛ پێشـوو؛ بـەروو؛ وەڵـین؛ وەریـن ‹نویسـندگان متقـدم: نووسـەرانی پێشین›.

**متقلـب** / motaqalleb, moteqalleb ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.* گزیکار؛ فێڵـبار؛ تەشقەڵـەباز؛ قەلبەزەن؛ تەڵەکەباز: ١. خاسـووک؛ گغـنی بـاز ٢. نادروسـت؛ دەبـەکار؛ شڵـتاخبـاز؛ دەغـەڵ؛ دەغەڵباز؛ عۆنیباز.

**مــتقن** / motqan: [عربـی] *صفت.* ١. دڵـنیاکەر ٢. پتەو؛ قایم؛ پاوەجێ؛ خۆگرتوو.

**متقی** / mottaqî ، ـان/: [عربـی] *صفت.* پارێزکـار؛ پەرهێزکار؛ دژکام؛ خۆپارێز؛ بەپارێز.

**متکـا** / motakkā ، ـهـا/: [عربـی] *اسم.* باڵشـت؛ سەرین؛ سەنیر؛ سەرینگا؛ سەنیا؛ بالگە؛ کیسەی لە پەڕ و لۆکە ئاخنراو بۆ ژێر سەر نان یـان پـاڵ پێوەدان.

**متکبـر** / motakabber, motekabber ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* لووتبـەرز؛ بـەدەمار؛ بڤـر؛ کـاو؛ بـە دەعیە؛ هوشک؛ کەشخەیی؛ کلاچ؛ قۆڕەماخ؛ بـە فیز؛ لە خۆبایی؛ بـادی هـەوا؛ گەبـەزە؛ گـەوەزە؛ گەڤەزە؛ زڕتک؛ فیـزن؛ قاپـان؛ تـرزل؛ سـەقەڵ؛ مەنەردار.

**متکـدی** / motakaddî, motekaddî ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* سوالکەر؛ گەدا؛ دەرۆزەکەر.

**متکفـل** / motakaffel, motekaffel: [عربـی] صفت. وەستۆگر؛ ئۆدەدار ‹او متکفل همه‌ی هزینه‌ها است: وەستوگری هەموو خەرجەکان ئەوە›.

**متکلـف** / motakallef, motekallef: [عربـی] *صفت.* بـە گـرێ و گـۆڵ؛ نائاسـایی و بـەبێ هـۆ دژوارەوەکراو.

**مـتکلم** / motakallem, motekallem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* ١. بێـژەر؛ وێـژەر؛ گۆتیـار؛ قسەکەر ٢. *[دستور]* یەکەم کەس (کـۆ یـان تـاک)

۳. کەلامزان؛ زانای زانستی کەلام.
▣ **متکلم مع‌الغیر**: *[دستور]* یەکەم کەسی کۆ.
**متکلم وحده**: ۱. *[دستور]* یەکەم کەسی تاک ۲. ئەوەی بە تەنیا هەر خۆی قسە دەکا.
**متکی** / mottakî/: [عربی] *صفت.* پشت‌گەرم؛ پاڵپشتدار ‹دیگر نباید به این و آن متکی باشی: چیتر نابێ بەم و بەو پشت‌گەرم بی›.
**متل** / matal ، ـها/: *اسم.* ۱. چیرۆکەشیعر؛ رازی مناڵان بە شیعر ۲. قسەی بن‌شڕ.
**متل** / motel ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* میوان‌سەرا؛ جێ حەسانەوەی مسافر لە قەراخ دەریا، ناورێگا یان هاوینەهەوارandا.
**متلاشی** / motalāšî, motelāšî/: [عربی] *صفت.* پەش؛ پەق؛ لێک‌هەڵوەشاو؛ لێک‌پژاو؛ هەپروون بە هەپروون؛ ورد و خاش؛ لە یەک پاشراو؛ چکیاگە؛ لەبەین چوو.
▣ متلاشی شدن: هەڵوەشان؛ لە بەر یەک چوون؛ لێک هەڵوەشان؛ هەپروون- هەپروون بوون؛ لەت و کوت/ تیکە-تیکە/ ورد و خاش بوون. هەروەها: **متلاشی کردن**
**متلاطم** / motalātem, motelātem/: [عربی] *صفت.* ۱. شەپۆلاوی؛ تایبەتمەندی دەریا و رووبار و... کە تووشی تەکان و شەکانی توند دەبێ ۲. *[مجازی]* شڵەژاو؛ هەژاو؛ شڵەژێو؛ تووشیاری شێواوی و پەرێشانی.
**متلک** / matalak ، ـها/: *اسم.* ترانە؛ لقووز؛ تیز؛ مەتەڵەک؛ پلندار؛ لابڕدونگ؛ لابردنگ؛ پلار؛ تڤنک؛ قسەی بە تێکۆڵ وێرای گاڵتە.
▣ **متلک بار کسی کردن**: تیز لە کەسێ گرتن؛ تیز بە کەسێ کردن؛ کەسێک بە قسەی چزدار و نالەبار زیزکردن ‹بخاطر پاپیونش خیلی متلک بارش کردند: بە هۆی پاپیونەکەیەوە زۆریان تیز تی‌گرت›.
**متلک پراندن**: لقووز خستن/ داین؛ مەتەڵەک گوتن؛ قسەی بە تێکۆڵ کردن.
**متلک گفتن**: پلار تێ‌گرتن؛ مەتەڵەک لێدان.
**متلون** / motalavven, motelavven/: [عربی] *صفت.* ۱. *[نامتداول]* ڕەنگاوڕەنگ؛ ڕەنگامە؛ بە ڕەنگی جۆراوجۆرەوە ۲. جۆراوجۆر ۳. *[مجازی]* وازوازی؛ حولحولی؛ هەر ساتێ لە سەر سازێ.
**متلون‌المزاج** / motalavvenolmezāc, motelavvenolmazāc/: [عربی] ☜ **متلون‌مزاج**
**متلون‌مزاج** / motalavvenmezāc, motelavvenmazāc ، ـها/: [عربی] *صفت.* ۱. وازوازی؛ دەمەدەمی؛ دەمەدەمی‌مەزاج؛ لێزۆکی؛ ڕاڕا؛ هەر تاوێ لە سەر قسە و ئاکارێ ۲. تاوێ ساغ تاوێ نەخۆش ✻ **متلوّن‌المزاج**
**متمادی** / motamādî, motemādî/: [عربی] *صفت.* دوور و درێژ ‹سالهای متمادی: سالانی دوور و درێژ›.
**متمایز** / motamāyez, motemāyez/: [عربی] *صفت.* ۱. هەڵاواردە؛ بە فەرقی بەرچاوەوە ۲. جیاواز؛ جیاکار؛ جیازە؛ جیا ۳. سەرپشکدار؛ خاوەن هەڤیازی.
**متمایل** / motamāyel, motemāyel/: [عربی] *صفت.* ۱. هۆگر؛ بە واز ‹متمایل به اَحزاب چپ: هوگری حیزبە چەپەکان› ۲. *[مجازی]* داهاتوو؛ بەرەو لایەک هاتوو ‹متمایل به راست: بە لای ڕاستدا داهاتوو›.
**متمتع** / motamatte', motematte' ، ـان/: [عربی] *صفت.* بەهرەمەند؛ بەشدار.
**متمدن** / motamadden, motemadden/: [عربی] *صفت.* ۱. پێشکەوتوو؛ خاوەن شارستانیەت ۲. بە فەرهەنگ.
**متمرد** / motamarred, motemarred ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.* چەڵەک؛ سەربزێو؛ یاخی؛ بزۆز؛ مکوڕ؛ نافەرمان؛ سەربادەر؛ کەنهەش؛ سەرپێچ.
**متمرکز** / motamarkez, motemarkez/: [عربی] *صفت.* ۱. کۆجێ؛ خاوەن ناوەندی ۲. کۆوەبوو؛

لێک خڕەوە بوو.

**متمسک** / motamassek, motemassek، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. دەستەداوێن؛ دەسەودامێن؛ دەستوداماو.

**متمکن** / motamakken, motemakken، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. دەوڵەمەند؛ دارا؛ بوودە؛ زەنگین.

**متملق** / motamalleq, motemalleq، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. شالووز؛ دەڵەچی؛ دەڵەچە؛ ڕیاباز؛ خولتەکەر؛ مەرایی‌کەر؛ خایەماڵ؛ زمان‌لووس؛ هولیسک؛ لالکەر؛ ڕووپاما؛ کلکەسووتەکەر؛ کلکەفلیٚ‌کەر؛ ڕووبین.

**متمم**[1] / motammem/: [عربی]/اسم. ۱. ـها/ پەیوەست ۲. ☜ زاویەهای متمم، **زاویه**

**متمم**[2]: صفت. تەواوکەر: ۱. دوایی‌هێنەر ۲. [مجازی] پڕکەرەوە.

**متمنی** / motamannî, motemannî/: [عربی] صفت. خوازمەند؛ تکاکار.

**متمول** / motamavvel, motemavvel، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. مالاڤا؛ بوودە؛ دەوڵەمەن؛ دەوڵەمەند؛ زەنگین و ماڵ خۆش.

**متن** / matn، ـها؛ متون/: [عربی]/اسم. مەتن: ۱. دەق؛ منهۆ؛ عەینی نووسراوەیەک بیٚ دەست لێدران و گۆڕان ‹متن مقاله، متن خبر: دەقی وتار؛ دەقی هەواڵ› ۲. دەق؛ بەشی سەرەکی و گرینگی نووسراوە یان فیلم ۳. تەخت؛ تەختە؛ بنەکوک؛ ژێر نەخشی وێنە و بەرهەمی هونەری ‹متن قالی لاکی است: تەختی قالیەکە گوڵخارە›.

**متناسب** / motanāseb, motenāseb/: [عربی] /اسم. ۱. هاوڕێژە؛ هاوڕێژ؛ هاوگر؛ هەڤگر؛ گونجاو؛ هاودەنگ و هاوسەنگی کەس یان شتێکی‌تر ‹این شغل متناسب با شخصیت تو نیست: ئەم پیشە هاوڕێژەی کەسایەتی تۆ نیە› ۲. لەبار؛ لەباو؛ ڕێک ‹اندام متناسب: بەژنی لەبار›.

**متناظر** / motanāzer, motenāzer/: [عربی] صفت. هاوچەشن؛ هاووێنە؛ هەڤرات؛ تەچ؛ زاناڤ؛ وەک‌یەک.

**متناقض** / motanāqez, motenāqez/: [عربی] صفت. دژیەک؛ دژبەیەک؛ لێکدژ.

**متناوب** / motanāveb, motenāveb/: [عربی] صفت. ۱. بە نۆرە؛ گەڕاوگەڕ؛ گەڕوەگەڕ؛ چەلاوچەل ۲. پەیتا پەیتا؛ پەسا پەسا؛ هەیتاهەیتا؛ شۆن‌ـ شۆن.

**متناهی** / motanāhî, motenāhî/: [عربی] صفت. بە بڕانەوە؛ بە دوایی؛ بە کۆتایی؛ خاوەن ئاخر و ئۆخر.

**متنبه** / motanabbeh, motenabbeh/: [عربی] صفت. تەمیٚ؛ چاوشکاو؛ پەندوەرگرتوو؛ بە هۆی لێقەومان دەست لە کاری ناڕەوا کێشاو ‹آرام پس از دعوای آن شب، متنبه شد: ئارام لە دوای شەڕی ئەو شەوەوە، تەمی بوو›.

**متنبی** / motanabbî, motenabbî/: [عربی] صفت. [نامتداول] پێغەمبەری درۆیی.

**متنعم** / motana'em, motena'em، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. بەهرەمەند؛ بەهرەوەر؛ بەتایبەت بەشدار لە ماڵ و سامان.

**متنفذ** / motanaffez, motenaffez، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. دەسەلاتدار؛ دەسچوو؛ دەسڕۆییو؛ خاوەن دەسەلات.

**متنفر** / motanaffer, motenaffer/: [عربی] صفت. وێزار؛ بێزار؛ وەڕز؛ وێڕس؛ وەڕەز؛ بێزکەر.

**متنوع** / motanavve', motenavve'/: [عربی] صفت. جۆرجۆر؛ جۆراوجۆر؛ جۆرواجۆر؛ جووراوجوور؛ جۆربەجۆر.

**متواتر** / motavāter, motevāter/: [عربی] صفت. پەیتا پەیتا؛ هەیتە هەیتە؛ هەیتا هەیتا؛ پەیاپەی؛ پەستا پەستا؛ لە سەر یەک.

**متواری** / motavārî, motevārî، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. ۱. هەلاتوو؛ وایەنی؛ تەقیو ۲. هەڵوەدا؛ تەرە؛ ئاوارە؛ دەربەدەر؛ دەروەدەر؛

سەرگەردان؛ دەرەندوو؛ بەرەزە.

**متوازن** / motavāzen, motevāzen/: [عربی] *صفت.* ۱. هاوکێش؛ هەڤسەنگ؛ هاوسەنگ؛ لە کێشدا بە قەد یەک ۲. هاوتەراز؛ هاوتا؛ لە یەک ریزدا.

**متوازی** / motavāzî, motevāzî/: [عربی] *صفت.* هاوبەر؛ هاوسان؛ تەریب.

**متوازی‌الاضلاع** / motavāziyol'azlā', motevāz-/: [عربی]/*اسم.* بیچمێکی تەختی هیندسی چوارلاسک کە لقەکانی دوو بە دوو بەرامبەر و هاوشانن.

**متوازی‌السطوح** / motavāziyossutûh, motevāziyossotûh/: [عربی]/*اسم.* بیچمێکی بۆشایی کە ڕووبەرەکانی دووبەدوو پێکەوە هاوشانن.

**متواضع** / motavāze', motevāze'/: [عربی] *صفت.* خاکەڕا؛ خاکی؛ بێ‌دەمار؛ خاکەسار؛ خۆشکێن؛ بێ‌فیز؛ بێ‌لاف؛ خۆ بە زل‌نەزان.

**متوالی** / motavālî, motevālî/: [عربی] *صفت.* لەسەریەک؛ پەیاپەی؛ پەیتاپەی؛ شوێن‌بەشوێن؛ پشت‌سەر یەک؛ یەک لە شوێن یەک؛ پشت بە پشت ‹دو سال متوالی: دوو سالی لەسەریەک›.

**متوالیا** / motavāliyan, motevāliyan/: [عربی] *قید.* لێکدا ـ لێکدا؛ پەیتا ـ پەیتا؛ پەستا ـ پەستا؛ لەپەستا؛ گوڕایگوڕ؛ پەساپەس؛ بە شێوەی یەک لە دوای یەک.

**متوجه** / motavacceh, motevacceh/: [عربی] *صفت.* ۱. ئاگادار؛ سەراپێ ‹متوجه سلامت خودش نیست: ئاگاداری ساغی خۆی نیە›۲. ڕووتێکەر ‹همەی سختی‌ها متوجه فقرا است: هەموو سەخڵەتێک ڕووتێکەری هەژارانە›.

⊡ **متوجه بودن:** ۱. پێ‌زانین؛ دیتن؛ ئاگا لێ‌بوون ۲. ڕوانین؛ زانین ۳. خەی دان؛ خێ دان؛ بە بیر و ویرەوە لەگەڵدا بوون.

**متوجه کسی بودن:** پای کەسێ گرتن؛ لە پای کەسێ بوون ‹تاوان این خسارت متوجه شما می‌شود: بژارەی ئەم خەسارە پای ئێوە دەگرێ›.

**متوحش** / motavahheš, motevahheš/: [عربی] *صفت.* هەراسان؛ تۆقاو؛ ترساو.

**متورم** / motavarrem, motevarrem/: [عربی] *صفت.* ماسیو؛ هەڵپفاو؛ هەڵمساو؛ هەلامسیو؛ ئاوساو؛ پەنەماو.

**متوسط** / motavasset, motevasset/: [عربی] *صفت.* ناونجی؛ ناونگ؛ ناوین؛ ناڤنج؛ مامناونجی؛ نیڤی؛ ناوەڕاست؛ ناوڕاس؛ ناوەندین؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی لە نێوان دوو ڕادەوە (باش یان خراپ، زۆر یان کەم، بەرز یان کورت و...) ‹حد متوسط: ڕادەی ناونجی›.

**متوسطه** / motavassete, motevassete/: [عربی] /*اسم.* دواناوەندی؛ خولی دواناوەندی؛ خولێکی خوێندکاری سێ یان چوارساڵەی پێش زانستگا.

**متوسل** / motavassel, motevassel ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.* دەسەودامێن؛ دەستەوداوێن؛ دەس‌وەدامان ‹برای استخدام به هر کسی و هر کاری متوسل شد: بۆ دامەزران دەسەودامێنی هەر کەسێک و هەر کارێک بوو›.

**متوطن** / motavatten, motevatten/: [عربی] *صفت.* ئاکنجی؛ هۆلس؛ ئارانشین؛ خاوەن شوێنێک بۆ نیشتەجێ بوون.

⊡ **متوطن شدن:** هێوران؛ نیشتەجێ بوون؛ ئاکنجی بوون؛ ئارانشین بوون؛ لە شار یان وڵاتێکدا نیشتەجێ بوون ‹او در آن شهر متوطن شد: لەو شارەدا هێورا›.

**متوفا**[1] / motavaffā, motevaffā ، متوفیات/: [عربی]/*اسم.* کۆچ کردوو؛ مردوو؛ کەسێ کە مردووە ‹متوفا از بستگان ما بود: کۆچ‌کردوو خزمی ئێمە بوو›: **متوفی**

**متوفا**[2]: *صفت.* کۆچ‌کردوو؛ مردوو ‹حاضران مرگ همسر متوفایش را به او تسلیت گفتند: ئامادەبوان مردنی هاوسەری کۆچ‌کردوویان لێ سەرخۆشی کرد›.

**متوفی** / motavaffā, motevaffā/: [عربی] ☜ **متوفّا**

**متوفیـــــات** / motavaffiyāt, motevaffiyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **متوفّا**

**متوقـع** / motavaqqe', motevaqqe'/: [عربـی] *صفت*. چاوەڕوان؛ چـاوەنۆڕ؛ چـاوەنزار؛ چاولـەدوا ‹متوقع بود به دیدنش برویم: چاوەڕوان بوو سەری لـێ بدەین›.

**متوقـف** / motavqqef, motevaqqef/: [عربـی] *صفت*. وەستاو؛ ڕاوەستاو؛ وێساگ؛ وێسیاگ.

▣ **متوقف شدن**: ڕاوەستان: ١. وەستان؛ وێسان؛ وێسیان؛ مدرەی؛ مردەی ‹سر کوچه متوقف شد: لـە سـەر کۆڵانەکـە ڕاوەسـتا› ٢. ڤەڤەسـتان؛ ڤەستان؛ لە جووڵە یان لە کار کەوتن ‹دو ماه اسـت کارخانـه متوقـف شـده اسـت: دوو مانگـە کارخانەکە ڕاوەستاوە›.

**متوقف کردن**: ڕاگرتن؛ خەفاندن؛ ڕاگیرکردن؛ قـەفالتن؛ بەسـتن؛ ڕاوەسـتاندن؛ مدرنـەی؛ ڤەڤەستاندن؛ ڤەستاندن.

**متوکل** / motavakkel, motevakkel، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. پشتبەستوو؛ پشتن‌بەستوو.

**متولـد** / motavalled, motevalled، ـهـا؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. لە دایکبوو؛ زاو؛ زادە؛ بە دنیـا هاتوو ‹متولد پیرانشهر است: لەدایکبووی خانەیە›.

**متولی** / motavallî, motevallî، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم*. متـەوەللی: ١. سەرپەرشـت و بەڕێوەبـەری کارێک ٢. کەسی کە بە سەر مزگـەوت، خانـەقا یان شوێنێکی ئایینی ڕادەگا ٣. کەسـێ کـە بـە سەر دووکان و زەمینی سەر بە مزگەوت، خانەقا یان شوێنێکی ئایینیدا ڕادەگا.

**متون** / mutûn, motûn/: [عربی] جمعِ ☜ **متن**

**متوهم** / motavahhem, motevahhem/: [عربی] *صفت*. ١. تۆقاو؛ پـەرۆش ٢. خـەیالاوی؛ گومـان داگرتوو.

**متـه** / matte، ـها/: *اسم*. زمـە؛ مەتـە؛ مەتکـەو؛ مەتکـەب؛ پلەمەتـە؛ مـەتێ؛ کونکـەرە؛ شـخاف؛ شخاق؛ شخاب؛ شغاب؛ سمە؛ سمـەک؛ سمبـە؛ سمۆ؛ بەهرەمە؛ بەریمە؛ ئامێری پێ کون‌کردن.

▣ **متەی برقی**: مەتەی بەرقی؛ مەتەی کارەبایی؛ زمەیـەک کـە بـە هێـزی کارەبا کـار دەکـا. هەروەها: **متەی دستی**

**متەی جغجغه**: مەتەی دەسکدار؛ کونکەرەیەک کە بە دەست هەڵدەسووڕێ.

▣ **مته به خشخاش گذاشتن**: *[کنایی]* ١. بە شوێن نیســـک و نەخۆشـــەردا گـــەڕان؛ زۆر بـــە وردەکاریدا ڕۆچـوون ٢. ڕەقاندنـەوە؛ زۆر لـە سەر چوون.

**متهم**[1] / mottaham، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی] *اسم*. بەرتاوان؛ ئەوەی کەوتۆتەبـەر بوختانێکـەوە کـە هێشـتا نەسـەلماوە ‹مـتهم بایسـتد: بـەرتاوان ڕاوەستێ›.

**متهم**[2]: *صفت*. تاوانبار ‹شما به دزدی مـتهم شـدەایـد: ئێوە بە دزی تاوانبار کراون›. هەروەها: **متهم بودن؛ متهم شدن؛ متهم کردن**

**متهـور** / motahavver, motehavver/: [عربـی] *صفت*. زاتدار؛ بەجەرگ؛ ئازا؛ وێرا؛ چەلاق؛ باڵۆلی؛ بێباک؛ زۆر نەترس.

**متهورانه** / motahavverāne, motehavverāne/: [عربی/ فارسـی] *قیـد*. دلێرانـە؛ نەترسـانە؛ بوێرانـە؛ ئازایانە ‹متهورانه در برابر مهاجمان ایستاد: دلیرانـە لـە بەرامبەر هەلمەتبەرانەوە هەڵوێستا›.

**متـیقن** / motayaqqen, moteyaqqen/: [عربـی] *صفت*. بێشک؛ بێ‌سێ‌ودوو.

**متیـــل** / metîl/: *اسـم*. متێـــل؛ پارچەیـــەکی کیسەئاسا بۆ لێف و دۆشەکە.

**متین** / matîn/: [عربی] *صفت*. ١. مەلهـەمێن؛ لـە سەرخۆ؛ نەرم و نیان؛ ئجلاف؛ سەبرۆکە ٢. پتەو؛ خۆگرتوو؛ پاوەجا؛ ڕاسا؛ قایم.

**مثابه** / masābe(h)/: [عربی] *اسم*. شێوە؛ وێنە.

▣ **به مثابه**: وەکوو؛ وەکی ‹این کار به مثابـەی دزدی

از مردم است: ئەم کارە وەکوو دزی لە خەڵکە›.

**مثـال** / mesāl ، ـها؛ مُثُل/: [عربی]/سم. نمانا؛ نموونە؛ وێنە.

**مثانـه** / masāne/: [عربی]/سم. میزەڵدان؛ مێزەڵدان؛ مێزەڵان؛ گمێزدان؛ میزڵدان؛ میزدان؛ میزدانک؛ میسمیسک؛ مسولدان؛ موسلدان؛ بسولدان؛ پڵدان؛ پوقدانک؛ تیزانگ؛ ترتەمانی؛ مالمیزک؛ ڕوودێن؛ چۆرکدو؛ مەسانە؛ کیسەی جێی کۆوە بوونی میز لە لەشدا.

**مثبـت** / mosbat/: [عربی] صفت. موسبەت؛ پوزیتیڤ: ١. باش؛ خاس؛ خاوەن باری بەکەڵک یان لێهاتوو ‹آدم مثبت؛ فعالیت مثبت: مرۆی موسبەت؛ چالاکی باش› ٢. خاوەن باری ئەرێنی ‹پاسخ مثبت: وەرامی موسبەت› ٣. خاوەن باری ڕاستەقینە و سەلماو ‹علوم مثبت: زانستە پوزیتیڤیەکان› ٤. [برق] خاوەن لێهاتوویی بەرەو لای خۆ کێشانی ئیلکترۆن * بەرانبەر: **منفی**

**مثقـال** / mesqāl ، ـها/: [عربی]/سم. مسقاڵ؛ مسقالە: ١. یەکەی کێشی کۆن بەقەد ٤,٥ گرەم ٢. [کنایی] تۆزقاڵ؛ تۆز؛ هێندێکی زۆر کەم.

**مثـل** / masal ، ـها؛ أمثال؛ أمثلە/: [عربی]/سم. ١. پەند؛ دەستەواژە؛ مەتەڵۆک؛ مەتهەلۆک؛ مەتەڵۆکە؛ قسەی نەستەق؛ وتەیێ کە بیر و ڕایەک دەردەبڕێ (وەک «ئاو لە سەرچاوکەوە لێلە»، یانێ «کار لە بنەوە خراپە») ٢. وێنە؛ نموونە؛ نمانا.

**مثل** / mesl ، أمثال/: [عربی]/سم. وێنە؛ وێنا؛ مینا؛ میناک؛ لف؛ هاوتا ‹در زیبایی مثل نداشت: لە جوانیدا وینەی نەبوو›.

**مثل** / mesle/: [عربی] حرف. وەکوو؛ وەک؛ وەکی؛ دەدی؛ نۆلا؛ چەشنی؛ هەزەی؛ جۆری؛ لە گوێن؛ چون؛ عەین؛ پێسەو؛ پسەو؛ پسۆ؛ مینا؛ میناک.

▣ **مثل آب خوردن**: وەکوو ئاو خواردنەوە؛ پێسەو ئاو واردەی؛ یەکجار سانا و هاسان ‹این کار برایش مثل آب خوردن است: ئەم کارە وەکوو ئاو خواردنەوەیە بۆی›.

**مثل آدم**: وەکوو/ وەک بنیادەم؛ ئەو جۆرەی کە شیاوی مرۆڤە ‹مثل آدم حرف بزن: وەک بنیادەم قسە بکە›.

**مثل ابر بهار**: وەک هەوری بەهار؛ وەک هەور و باران؛ پێسەو وارانی/ قەڵوەزی (سەبارەت بە گریان) ‹مثل ابر بهار اشک می‌ریخت: وەک هەوری بەهار فرمێسکی دادەباراند›.

**مثل اجل‌معلق**: وەکوو تریشقەی بەڵا؛ بە پەلە و لە ناکاو (لەمەڕ هاتنی نابەجێ و ناوەختی کەسێکەوە دەگوترێ) ‹در یک چشم به هم زدن دو نفر مثل اجل معلق سر رسیدند: لە چاوتروکانێکدا دوو کەس وەک تریشقەی بەلا گەیشتن›.

**مثـل اسـتخوان**: ١. وەک هەلووک؛ دارکەپێچان؛ زۆر لەڕ و لاواز ٢. وەک بەرد؛ وەک ئێسک؛ پێسەو تۆلاشی؛ زۆر سفت و سەخت وەکوو بەرد ‹این نان کە مثل استخوان است، اصلاً نمی‌شود خورد: ئەم نانە خۆ وەک بەردە، هەر ناخورێ›.

**مثـل اسفند روی آتش**: وەک دانەبرێشکە؛ وەک دانەی سەر ساج؛ بێئۆقرە؛ هەوڵ و پەرێشان ‹مثل اسفند روی آتش یک دقیقە آرام نداشت: وەک دانەبریشکە، ساتێک هەدا دانی نەبوو›.

**مثل اشک چشم**: وەک چاوی قرژانگ/ قاژنگ؛ وەک ئاوی چاو؛ پێسەو چەموو کەڵەشێری؛ زۆر ڕوون و خاوێن ‹آبی داشت مثل اشک چشم: ئاوێکی هەبوو وەک چاوی قرژانگ›.

**مثل الماس**: وەک ئەڵماس؛ پێسەو ئەڵماسی؛ زۆر تیژ و بەبڕشت.

**مثل امامزادەی بی‌زینت**: وەک ماڵی خوا؛ وەکی پیرەپەڕۆ؛ وەکوو چاکی پەڕۆیان؛ بەبێ ئەسباب و کەل‌وپەلی شیاو ‹یک اتاق داشتند لخت و خالی، مثل امامزادەی بی‌زینت: ژوورێکیان

هەبوو وەک مالی خوا، رووت و قووت›.

**مثل امامزادەی جل‌بندی:** کۆنەپۆش؛ ڕیتاڵ؛ شڕەبەر؛ شڕەبار.

**مثل بازار شام:** وەک ماڵە خەڕات؛ وەکوو گاڵەبازاڕ؛ وەک بازاڕی شێخ هەمزە؛ زۆر شێواو و ئاڵۆز ‹خانە را کردە بودند مثل بازار شام: ماڵەکەیان وەک ماڵە خەڕات لێ‌کردبوو›.

**مثل برج زهرمار:** درش؛ ناوچاوتاڵ.

**مثل برق:** وەک بەرق؛ وەک با؛ پێسەو تیریێ؛ گورج و بە پەلە ‹مثل برق خودت را برسان!: وەک بەرق بگەیە!›.

**مثل برگ گل:** وەک پەڕەی گوڵ؛ پێسەو هەورێشمی؛ زۆر نەرم و خاوێن ‹پوستی داشت مثل برگ گل: پێستێکی هەبوو وەک پەڕەی گوڵ›.

**مثل برە:** وەک پەز پێغەمبەر؛ وەک پەپوولە؛ پێسەو/ عەینوو مەی؛ کەوی و بێ ئازار.

**مثل بلبل:** وەکوو بلبل؛ وەک بولبول ‹مثل بلبل انگلیسی حرف می‌زد: وەک بلبل ئینگلیزی قسەی دەکرد›.

**مثل بند تنبانِ کوتاه:** گونەڵ؛ کەسێ یان شتێ کە نەیەتە دەستەوە، نەتوانن بیگرن و هەڵبێت.

**مثل بید:** وەک وەنەن؛ وەک وەنەن هەجیج؛ وەک بی؛ پێسەو/ عەینوو وەنەنێ؛ لەرزۆک ‹مثل بید از سرما می‌لرزید: لە سەرمادا وەک وەنەن دەلەرزی›.

**مثل پرِ کاه:** وەک/ وەکوو پووش؛ زۆر سووک ‹مثل پر کاه بلندش کرد: وەکوو پووش بەرزی کردەوە›.

**مثل پنبە و آتش:** وەکوو ئاور و کا؛ وەک پیفک و پەمۆ؛ وەک ئەستێ و پووشوو؛ پێسەو ئایر و پووشی؛ ناتەبا و دژ بە یەک.

**مثل پنجەی آفتاب:** وەک مانگی شەوی چواردە؛ متورفە؛ وەک مانگ؛ زۆر جوان ‹دختری داشت مثل پنجەی افتاب: کچێکی بوو وەک مانگی شەوی چواردە›.

**مثل پوست پیاز:** وەک قاقەز؛ وەک تووژ؛ پێسەو تۆکڵە هێلەی؛ ناسک و بێ‌بەرگە.

**مثل تیر:** وەک تیر؛ وەکوو با؛ پێسەو وای؛ زۆر تون و تیژ ‹چنان می‌دوید مثل تیر: وەک تیر دەڕۆیشت›.

**مثل تیشە:** وەک ڕسق؛ خۆویست؛ خۆپەرس ‹مثل تیشە همەاش بە طرف خودش می‌تراشد: وەک ڕسق هەر بۆ خۆی کۆ دەکاتەوە›.

**مثل جگر زلیخا:** وەکوو کۆتەی قەساب؛ لەت و پەت و ونجڕ ـ ونجڕ ‹لباس بە تنم شدە بود مثل جگر زلیخا: جلەکانم لەبەرمدا وەکوو کوتەی قەسابیان لێ هاتبوو›.

**مثل جنازە:** وەک ڕێوی تۆپیو؛ وەک مردگ؛ بێ‌جم و جووڵ ‹مثل جنازە افتادە بود و تکان نمی‌خورد: وەک ڕێوی تۆپیو کەوتبوو، جووڵەی نەدەکرد›: **مثل مردە/ میّت**

**مثل جن بوداده:** وەک هەلووک؛ مەڕەمووکە؛ زۆر لەڕ و لاواز.

**مثل جهنم:** وەک جەحانم؛ جێگای زۆر گەرم و ناخۆش.

**مثل چوب کبریت:** ١. وەک چوکڵە؛ وەک داسک و دەرزی؛ پێسەو نەیچەنی؛ لەڕ و لاواز ٢. وشک‌وپشک؛ وشک و برین؛ وشک و بێ‌نم.

**مثل حمام:** وەکوو حەمام؛ جێگای زۆر گەرم و شێدار ‹هوا مثل حمام گرم و شرجی بود: هەوا وەک حەمام گەرم و بۆق بوو›.

**مثل حمام زنانە:** وەکوو حەمامی ژنان؛ وەک حمام ژنانە؛ جێگای قەرەباڵغ و پڕ زڵە.

**مثل خر:** وەک/ وەکوو کەر؛ پێسەو گاوێ؛ نەفام و بێ‌فەرهەنگ.

**مثل خر عصاری:** وەکوو گای بنە؛ وەک ئاوڕۆشنەوکەرە؛ بە کار و تێکۆشانی زۆری

بــێبایەخــەوە ‹مثـل خـر عصاری دور خودمـان می‌چـرخیم: وەکـوو گـای بنـە لـە دەوری خۆمـان هەڵدەسووڕین›.

**مثل خروس بی‌محل**: وەک کەڵەشێر ناوەخت؛ نابەجێ و نەگونجاو ‹یکباره مثل خروس بی‌محـل شـروع کـرد بـە حـرف زدن: لـە کـوتوپـڕا وەک کەڵەشێر ناوەخت دەسی کرد بە قسە کردن›.

**مثل دستەی گل**: وەکوو دەستەی/ تۆپی گوڵ؛ وەک چەپکـــەی گـــوڵ؛ وەک گـــوڵ؛ زۆر ڕێکوپێک و جوان ‹خانە را مثل دستەی گل تمیز و مرتب کردە بود: ماڵەکەی وەک دەسـتەی گـوڵ خاوێن و ڕێکوپێک کردبوو›.

**مثـــل دوک**: وەک دارکـــەپێچان؛ وەکـــوو هەلووک؛ قرخن؛ زۆر لەڕ و لاواز.

**مثل ریگ**: وەک گەڵای دار؛ پێسـەو تفەتـەڕا؛ یەکجار زۆر ‹مثل ریگ پول خـرج مـی‌کـرد: وەک گەڵای دار پووڵی خەرج دەکرد›.

**مثـــل زالـــو**: وەک زەروو؛ وەک گەنـــە؛ وەک تووڕک؛ پێسەو دڕەی؛ پێوەنووساوی لـەنجباز و مزاحیم ‹مثل زالو بهم چسبیدە بود و ول نمی‌کرد: وەک زەروو پێمەوە نووسابوو بەری نەدەدام›.

**مثل ساعت**: وەکوو سەعات؛ ڕێکوپێـک ‹مثـل ساعت کار می‌کرد: وەک سەعات کاری دەکرد›.

**مثل ستارەی سـهیل**: وەک گوڵـەگەزیزە؛ وەک قەن ماڵـەگەدا؛ وەک قـەن مـاڵ شـێخ ‹مثـل سـتارەی سـهیل شـدەای، پیـدایت نیسـت!: وەک گوڵەگەزیزەت لێهاتووە، دیار نیت!›.

**مثل سد سـکندر**: وەکـوو پـۆڵا؛ زۆر قـورس و قایم.

**مثل سگ**: وەکوو سەگ؛ پێسەو تووتەی؛ تووڕە و شەڕانی ‹مثل سگ پر و پاچەی همە را می‌گرفت: وەکوو سەگ لاقی هەمووی دەگرت›.

**مثل سگ پاسوختە**: وەکوو مریشکی سـەربڕاو؛ وەک سـەگ پـا سـووتیاگ؛ پێسـەو کـەرگێ پاسـۆتێ؛ پەرێشـان و بـێئـۆقرە ‹مثـل سـگ پاسوختە بە هـر طـرف مـی‌دویـد: وەکـوو مریشـکی سەربڕاو هەر هەڵدەهات›.

**مثل سنگ**: وەک/ وەکوو بەرد؛ پێسەو تەوەنێ؛ زۆر سەخت.

**مثل سـنگ و شیشـە**: وەک پـووش و ئەسـتێ؛ وەکوو کـارد و پـەنیر؛ ناتـەبا و نەسـاز؛ دژ بـە یەک.

**مثل شاخ شمشاد**: وەک عەرعەر؛ وەک سـەوڵ؛ خۆش قـەو؛ ڕێـکوپێـک؛ بـەژنڕێـک ‹مثـل شـاخ‌شمشـاد مقابلـت ایسـتادە: وەک عەرعـــەر لەبەرامبەرتەوە وەستاوە›.

**مثل شتری کە بە نعلبندش نگاە می‌کند**: تـووڕە و قەتیس.

**مثل شیر**: وەک شـێر؛ پێسـەو شـێری: ١. زۆر نەترس و دلێر ٢. بوێرانە؛ دلێرانە.

**مثل شیر مادر**: وەک شیری دایک؛ وەک شـیر دالگ؛ پێسەو شۆتوو ئەدای؛ ڕەوا؛ حەلاڵ.

**مثل شیشە**: وەک شووشە؛ تورت و پەژ.

**مثل عَلَم یزید**: وەک وشتری ناو پەمۆ؛ درێژ تـا ئێوارە؛ زۆر درێژ و لۆق.

**مثل فرفرە**: وەک فرفـرە؛ پێسـەو پلیزگـردێ؛ فرز و خێرا.

**مثل کـارد و پنیـر**: وەک کـارد و پـەنیر؛ وەک ئەستێ و پووشوو؛ زۆر دژ بە یەکتر ‹آنهـا مثـل کارد و پنیرند، یک هفتە با هم سر نمـی‌کننـد: ئـەوان وەک کـارد و پـەنیر وان، حـەوتووێک پێکـەوە ناژین›.

**مثل کاە**: وەک بەی؛ زۆر زەرد.

**مثل کف دست**: وەک لـەپی/ بـەری دەسـت؛ وەک ناودەس؛ ڕێک و بێگرێ و گۆڵ.

**مثل کنە**: وەک مچ/ گەنە؛ پێداگر؛ نەگـەویس ‹مثل کنە بهم چسـبیدە بـود و ولـم نمـی‌کـرد: وەک گەنە پێمەوە نووسابوو لێم نەدەبۆوە›.

**مثل کورە**: وەک کوورە: ١. وەکوو تەنوور؛ زۆر گەرم ٢. زۆر بە یاو.

**مثل کوه:** وەک/ وەکوو کێو ‹مثل کوه ایستاد و خم به ابرو نیاورد: وەک کێو وێسا و بە بای خەیاڵیشیدا نەهات›.

**مثل گربەی کور:** وەک پشیلە؛ سپڵە و پێنەزان.

**مثل گوشت قربانی:** وەکوو کەوڵی قەرەچی؛ وەک ماڵی ئازیەتی ‹ریختند و مثل گوشت قربانی تکه ـ تکه‌اش کردند: ڕژانە سەری و وەکوو کەوڵی قەرەچی لەتوپەتیان کرد›.

**مثل لکلک:** وەک حاجی لەقلەق؛ لۆقلۆقی؛ درێژ و باریک.

**مثل مرده/ میت** ☜ **مثل جنازه**

**مثل موم:** وەک مۆم: ١. زۆر نەرم؛ نەرم و نۆڵ ٢. *[مجازی]* ڕام و فەرمانبەر ‹در دستش مثل موم بود: وەک مۆم لە دەستیدا بوو›.

**مثل نی‌قلیان:** زۆر لەڕ و لاواز؛ داڵگۆشت؛ قاڕووعەم.

**مثل هلو:** ١. جوان و خۆشڕەنگ ٢. شیرین و خۆش.

▣ **مثل خر در گل ماندن:** *[تعریض]* وەکوو کەر لە قوڕدا چەقین؛ تێچەقین؛ هیلاک و بێ دەرەتان داکەوتن.

**مثل** / mosol/: [عربی] جمعِ ☜ **مثال**

**مثلاً** / masalan/: [عربی] *قید.* ١. بۆ وێنە ‹ایران را مثلاً با کره مقایسه کنیم: بۆ وێنە ئێران لەیەل کورەدا بەرامبەر کەینەوە› ٢. گوایا؛ گوایە؛ گوا؛ چما ‹مثلاً تو اینها را شسته‌ای؟!: گوایە تۆ ئەمانەت شۆردووە؟!›.

**مثلث**/ mosallas، ـها؛ ـات *[نامتداول]*/: [عربی] *اسم.* سێگۆش؛ سێسووچ؛ سێکونج: ١. بیچمێکی هیندسی بە سێلق و سێکونجەوە ٢. سیانە؛ دەستەی سیانی ‹مثلث شرارت: سیانەی شەڕاشۆیی› ٣. *[نجوم]* هەر کام لە دوو کەلووەی سێسووچی باشووری و سێسووچی باکووری.

▣ **مثلث بازگوشه:** سێکونجێ کە کونجێکی زۆرتر لە ٩٠ دەرەجەیە: **مثلث منفرجه**

**مثلث تندگوشه:** سێ گۆشەیێ کە هەر سێ کونجەکەی لە ٩٠ پلەک کەمتر بێت: **مثلث حاده**

**مثلث جنوبی:** *[نجوم]* وێنەیەکی گەردوونی بچووک لە نێوان کەلووی شێر و هۆشەدا: **نهران**

**مثلث حادّه** ☜ **مثلث تندگوشه**

**مثلث راستگوشه:** سێ کونجێ کە یەکێ لە کونجەکانی ٩٠ دەرەجەیە: **مثلث قایم**

**مثلث سه پهلو برابر:** سێکونجی لق/ لاسک بەرامبەر؛ سێ کونجێ کە هەر سێ لقەکەی پێکەوە بەرامبەرن: **مثلث متساوی‌الاضلاع**. هەروەها: **مثلث سه‌گوشه‌برابر**

**مثلث شمالی:** *[نجوم]* وێنەیەکی ئاسمانی لە نێوان بەرخ و ژنی پێ لە زەنجیردا.

**مثلث قایم** ☜ **مثلث راستگوشه**

**مثلث کروی:** سێ کونجێ کە بە سەر گۆیەکەوە بەدی دێ.

**مثلث متساوی‌الاضلاع** ☜ **مثلث سه پهلو برابر**

**مثلث متساوی‌الساقین:** سێکونجی دوولق یەکسان؛ سێ کونجێ کە دوو لقی پێکەوە بەرامبەرن.

**مثلث مختلف‌الاضلاع:** سێ کونجێ کە لقەکانی پێکەوە بەرامبەر نین. هەروەها: **مثلث مختلف‌الزّوایا**

**مثلث منفرجه** ☜ **مثلث بازگوشه**

**مثلثات** / mosallasāt/: [عربی] *اسم.* ١. *[نامتداول]* جمعِ ☜ **مثلث** ٢. لقێک لە زانستی بیرکاری کە دەپەرژێتە سەر سێکونج و تایبەتمەندیەکانی.

**مثلثی** / mosallasî/: [عربی] *اسم.* سێکونجی؛ سێگۆشی؛ سێسووچی.

**مثله** / mosle/: [عربی] *صفت.* لووت و گوێبڕاو؛ لووت و گوێچکە کریاگ.

▣ **مثله کردن:** ١. گوێ و لووتی کەسێ بڕین

۲. *[مجازی]* داپاچین؛ ئەرەپاتەی؛ بە هۆی دەس‌لێدان، شتێک خراپ‌کردن ‹سانسورچی‌ها فیلم را مثله کرده بودند و هرچه نگاه کردیم چیزی دستگیرمان نشد: سانسۆرچیەکان فیلمەکەیان داپاچیبوو، هەرچی سەیرمان کرد هیچی لێ حالی نەبووین›.

**مشمر** / mosmer/: [عربی] *صفت*. بەردار: ۱. بە بەر ‹درخت مشمر: داری بەردار› ۲. بەکەڵک؛ سوودمەند ‹کمکهای او مشمر واقع نشد: یارمەتیەکانی بەکەلک نەبوون›.

**مثمن**[1] / mosamman، ـها/: [عربی] /*اسم*. هەشتێنە؛ چەشنێک موسەمەت کە هەر بەندێکی هەشت‌باڵی هەیە.

**مثمن**[2]: *صفت*. هەشتێنە؛ بە هەشت بنەما یان کۆڵەکەوە.

**مثنوی** / masnavî، ـها/: [عربی] /*اسم*. دووخشتەکی؛ هۆنراوەیێ کە باڵەکانی هەر بەیتێک پێکەوە هاوپاشڵن و لە سەر یەک کێش دارێژراون.

**مثنی** / mosannā/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* دوانی؛ دوو دانەیی.

**مجاب** / mocāb/: [عربی] *صفت*. بێ‌قسە؛ وەلام‌گرتوو؛ وەرام دەست‌کەوتوو.

⊡ **مجاب شدن**: بێ‌قسە بوون؛ قانیع بوون ‹با دلیلهایی که او می‌آورد همه مجاب شدیم: بەو بەڵگانە دەیهێنایەوە هەموومان بێ‌قسە بووین›.

**مجاب کردن**: بێ‌قسە کردن؛ قانیع کردن.

**مجادلات** / mocādelāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مجادله**

**مجادله** / mocādele، ـها؛ مجادلات/: [عربی] /*اسم*. *[ادبی]* ۱. کێشە؛ شەڕەقسە؛ قڕوچیرەک؛ گلتە؛ جراجڕ؛ شەڕەدندوکە؛ شەڕەچەقە؛ کار و ڕەوتی یەک و دووکردن؛ هەرا کردن ‹بر سر هیچ و پوچ با هم مجادله می‌کردند: لە سەر هیچ‌وپووچ کێشەیان دەکرد› ۲. شەڕ؛ مشت‌ومڕ؛ گیرە و کێشە؛ ملە؛ ململانێ ۳. *[قدیمی]* دوژمنایەتی؛ دژبەرایەتی.

**مجار** / macār/: *اسم*. ۱. هۆزی ڕەسەنی نیشتەجێی مەجارستان ۲. ـها/ خەڵکی ئەو هۆزە ۳. زمانی ئەو هۆزە، لە زمانگەلی فینۆئویغووری.

**مجاری**[1] / macārî/: [عربی] جمعِ ☜ **مجرا**

**مجاری**[2]: *صفت*. مەجاری؛ مەجارستانی؛ سەر بە مەجارستان.

**مجاز** / macāz/: [عربی] /*اسم*. مەجاز؛ وشەیێ کە لە مانایێکی‌تر جگە لە مانای سەرەکی خۆی بە کار بچێ (وەک «شێر» بە مانای بەهێز و دلێر).

**مجاز** / mocāz/: [عربی] *صفت*. ڕێ‌پێ‌دراو؛ ڕەوا؛ قانوونی: ۱. بەبێ بەرگری قانوونی یان کۆمەڵایەتی ‹کالای مجاز: کەل‌وپەلی ڕێ‌پێ‌دراو› ۲. بە بڕوانامە و ئیجازەنامەوە ‹کارگاه مجاز: کارگەی قانوونی›.

⊡ **مجاز بودن**: بۆ بوون؛ ڕەوا بوون؛ ڕێ بوون؛ بێ‌لەمپەڕ بوون ‹هر مسافر مجاز است ۱۵ کیلو بار همراه ببرد: هەر مسافرێک بۆی هەیە ۱۵ کیلۆ بار دەگەڵ خۆی ببا›.

**مجازاً** / macāzan/: [عربی] *قید*. ۱. بە مەجاز؛ بە مانایەکی‌تر، جگە لە مانای سەرەکی ۲. ناڕاستەقینە؛ بەڕواڵەت.

**مجازات** / mocāzāt، ـها/: [عربی] /*اسم*. سزا.

⊡ **مجازات شدن**: سزا دران ‹مجرم مجازات شد: تاوانکار سزا درا›: **به مجازات رسیدن**

**مجازات کردن**: سزا دان ‹او را به خاطر سرپیچی از دستور مجازات کردند: بە هۆی سەربادان لە دەستوور سزایان دا›: **به مجازات رساندن**

**به مجازات رساندن** ☜ **مجازات کردن**

**به مجازات رسیدن** ☜ **مجازات شدن**

**مجازی** / macāzî/: [عربی] *صفت*. مەجازی: ۱. سەر بە مەجاز ۲. ڕواڵەتی؛ ناڕاستەقینە. بەرانبەر: **حقیقی**

**مجال** / macāl/: [عربی] /*اسم*. دەرفەت؛ بوار؛

بواره؛ دەرەتان؛ بگار؛ دەلیڤە؛ ماوە؛ بگارە؛ ڕێگـە: ۱. هەل ‹مجال سر خاراندن نداشتم: دەرفەتـی سـەر خوراندنم نەبوو› ۲. بووز؛ بۆ لـوان ‹در آنجا مجـال گفتگو نبود: لەوێ ڕێگەی وتووێژ نەبوو›.

**مجالس** / macāles/: [عربی] جمعِ ☜ **مجلس**

**مجالست** / mocālesat ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* هاونشینی.

**مجامع** / macāme'/: [عربی] جمعِ ☜ **مَجمَع**

**مجامله** / mocāmele ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* زوانبازی؛ زمـانچـەوری؛ زمـانلووسـی؛ بـەکار هێنانی وشە و ڕستەی جوان و ڕازاوە لە قسـەدا بۆ فریودانی خەڵک.

**مجاناً** / maccānan/: [عربی] *قید.* بە خۆڕایی؛ (بـە) هەروا؛ بە مفتە ‹مجاناً در اختیار علاقەمندان گذاشـت: بە خۆڕایی خستیە بەردەست هۆگرانەوە›.

**مجـانی** [۱] / maccānî/: [عربـی] *صـفت.* بـەلاش؛ خۆڕایی؛ بێنرخ؛ مفت؛ مفتـە ‹نـان مجـانی: نـانی بەلاش›.

**مجـانی** [۲]: *قیـد.* بـە خـۆڕایی؛ (بـە) هـەروا؛ بێوەرگرتنی نرخ ‹مجانی می‌بردند، من هم رفتم: بە خۆڕایی دەیانبرد، منیش ڕۆشتم›.

**مجانین** / macānîn/: [عربی] جمعِ ☜ **مجنون**

**مجاور** [۱] / mocāver ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* ئەوەی بۆ خێر دەبێتە لانشینی شوێنێکی پیرۆز.

**مجاور** [۲]: *صفت.* پەنا؛ لـە پـەنا؛ جیـران؛ کـەناری؛ هاوسێ؛ پاڵدەست؛ تەنیشت؛ دراوسـێ؛ هامسا؛ لاپاڵ؛ پاڵبەپاڵ ‹خانەی مجاور مدرسە: ماڵی پـەنای قوتابخانە›.

**مجـاورت** / mocāverat ، ـهـا/: [عربـی] *اسـم.* دراوسێیەتی؛ دراوسێیی؛ هاوسایەتی؛ هامسایەتی؛ جیرانی.

**مجاهد** / mocāhed ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* ۱. خەباتکار؛ خەباتگێـر؛ ئـەوەی خـەبات دەکـا ۲. موجاهید؛ هەر کام لە ئەندامانی برێ لە پارتە سیاسیەکانی ئێـرانی یـان ئیسـلامی هاوچـەرخ ‹مجاهد افغانی: موجاهیدی ئەفغانی›.

**مجاهـدات** / mocāhedāt/: [عربـی] جمـعِ ☜ **مُجاهدَت**

**مجاهدت** / mocāhedat ، ـها؛ مجاهـدات/: [عربـی] *اسم.* تێکۆشان: ۱. خەبات ۲. هـەوڵ و تـەقالای بێبڕانەوە بۆ گەیشتن بە ئامانج: **مُجاهده**

**مجاهده** / mocāhede ، ـها/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* ☜ **مُجاهدَت**

**مجبور** / macbûr/: [عربی] *صفت.* ناچار؛ نـاگوزیر؛ مەجبوور؛ گەنگیر؛ ناعەلاج؛ ناعیلاج ‹مجبور شدیم خانە را بفروشیم: ناچار بووین ماڵەکە بفرۆشین›.

**مجبوراً** / macbûran/: [عربـی] *قید.* لە ناچاری؛ بە ناچـار؛ بـە مـەجبووری؛ ناچـار؛ نـاگوزیر؛ بـە ناعەلاجی ‹مجبوراً بە دنبالش راه افتادم: لـە ناچـاری کەوتمە شوێنی›.

**مجبـوری** [۱] / macbûrî/: [عربـی] *اسـم.* ناچـاری؛ ناعەلاجی؛ ناعیلاجی؛ ناگوزیری ‹از روی مجبوری بە اینجا آمدیم: لە ڕووی ناچاریەوە هاتین بۆ ئێرە›.

**مجبـوری** [۲]: *قیـد. [گفتـاری]* نـاعیلاجی؛ ناچـاری؛ ناگوزیری؛ لـە ڕووی مەجبووریـەوە ‹آمـدنمان بـە تهران مجبوری بود: هاتنمان بۆ تاران ناعیلاجی بوو›.

**مجبوریـت** / macbûrîyyat ، ـهـا/: [عربـی] *اسـم.* ناچـاری؛ ناچاریـەتی؛ نـاگوزیری؛ مـەجبووری؛ مەجبووریەتی؛ چۆنیـەتی و شـێوازی مـەجبوور بوون.

**مجتمع** / moctama', moctame' ، ـها/: [عربـی] *اسم.* کۆمەڵە؛ جڤاک؛ شەماتە؛ جەملـە؛ کۆمەڵـێ کـە ئەندامـەکانی لـە بـاری چۆنیـەتی یـان کـارکردەوە لەیـەک دەچـن ‹مجتمع صنعتی: کۆمەڵەی پیشەسازی›.

▣ **مجتمـع بیمارسـتانی:** پـۆلی‌کلینیـک؛ نەخۆشخانەیەک بە کۆمەڵێ دەرمانگا و بەشی جۆراجۆری ڕاژەی دەرمانیەوە.

مجتمـع مسکونی: کۆمـال؛ کـۆدێن؛ کۆمەڵـە خانووی لە پـەنای یـەک. هـەروەها: **مجتمع**

آپارتمانی؛ مجتمع تجاری

**مجتمع** / moctame', moctama'/: [عربی] *صفت.* کۆکراوە؛ خڕکراو؛ کۆوەبوو؛ کۆبوو؛ لێک‌کۆکراو.

**مجتهد** / moctahed ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* ۱. مەلای ئایین کە بە هۆی زانست و لێهاتووییەوە دەتوانێ لە سەر بابەتەکانی دینی بیر و ڕا دەربڕێ ۲. *[قدیمی]* سەرترین پلەکی زانستی لە لقێکی زانستیدا.

**مجد** / macd/: [عربی] *اسم. [ادبی]* سەربەرزی؛ سەربڵندی.

**مجد** / moced(d)/: [عربی] *صفت.* تێکۆشەر؛ کۆشا.

**مجدانه** / moceddāne/: [عربی/ فارسی] *قید. [ادبی]* بە پێداگریەوە؛ بە هەوڵ و تێکۆشانەوە ‹مجدانه پیگیری می‌کرد: بە پێداگریەوە شوێنی دەگرت›.

**مجدد** / mocaddad/: [عربی] *صفت.* دووبارە؛ چەندجارە؛ چەندبارە؛ چن‌جارە ‹تلاش مجدد هم فایده‌ای نداشت: هەوڵی دووبارەش کەڵکی نەبوو›.

**مجدد** / mocadded/: [عربی] *اسم. [ادبی]* تازەکەرەوە؛ تازەوەکەر؛ نوێکار.

**مجدداً** / mocaddadan/: [عربی] *قید.* دیسانەوە؛ دووبارە؛ هەمدیس؛ ژنۆ؛ نۆز؛ سەرلەنوێ؛ نۆژەن ‹مجدداً تلاش کردم ولی فایده‌ای نداشت: دیسانەوە هەوڵم دا بەڵام کەڵکی نەبوو›.

**مجذوب** / maczûb/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ۱. *[نامتداول]* ڕاکێشراو ۲. شەیدا؛ ئەویندار.

**مجذور** / maczûr/: [عربی] *صفت. [ریاضی]* بن‌ڕیشە؛ بەرهەمی لێدرانەوەی ڕەقەمێک لە خۆیدا (وەک ۱٦ و ۲٥ کە دەبنە بن‌ڕیشەی ٤ و ٥).

**مجرا** / macrā ، ـها؛ مجاری/: [عربی] *اسم.* ۱. ئاوەڕۆ؛ ئاوەڕوێ؛ ژێراو؛ زێراب؛ ئاوەڕێژ؛ وەراو؛ گونج؛ گونجە ‹مجرای فاضلاب: ئاوەڕوی پیشاو› ۲. بوار؛ بوارگە؛ شوێن و شێوازی ئاسایی بۆ جێبەجێ بوونی کارێک ‹بهتر است کار از مجرای اداری پیش برود: کارەکە باشترە لە بواری مەزرینگەییەوە بڕواتە پێش›.

**مجرا** / mocrā/: [عربی] *صفت.* بەڕێوەبردنی: **مُجری**

**مجرب** / mocarrab/: [عربی] *صفت.* ۱. لێزان؛ بەئەزموون؛ فێربوو؛ لەکار ڕاهاتوو ۲. تاقی‌کراوە.

**مجرد** / mocarrad ، ـها/: [عربی] *صفت.* ۱. تەنیا؛ تەنها؛ تەنێ؛ قوتار؛ سەڵتە ۲. /ـان؛ ـین/ هورم؛ ڕەبەن؛ ڕەبەنۆک؛ سۆبا؛ سەڵت؛ زگوردی؛ بێ‌هاوسەر؛ قازاخ؛ (بۆ کچ)؛ زگورد؛ زوگورد ۳. جیا؛ جیاواز؛ بە دوور.

▣ **بە مجرد اینکە:** هەرکە؛ هەتا؛ تا؛ تاکوو؛ هەتاکوو؛ هەتاوەکوو؛ هەتاوەکوونێ؛ هەتاکە ‹به مجرد اینکه مرا دید: هەرکە منی دیت›.

**مجردی** / mocarradî/: [عربی] *صفت.* سەڵتی؛ بێ‌هاوسەری.

**مجرگ** / macarg/: *اسم. [قدیمی]* بێگاری؛ زەود؛ سۆژە؛ سۆخرە.

**مجرم**[1] / mocrem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* تاوانبار؛ تاواندار؛ خەتابار ‹مجرم را بیاورید!: تاوانبارەکە بێنن!›.

**مجرم**[2]: *صفت.* تاوانبار؛ خەتاکار؛ گوناکار؛ گونابار ‹او را مجرم شناختند: بە تاوانباریان زانی›

هەروەها: **مجرم بودن؛ مجرم شناخته شدن**

**مجرمیت** / mocremîyyat/: [عربی] *اسم.* تاوانباری؛ گوناکاری؛ گوناباری.

**مجروح**[1] / macrûh ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* زامدار؛ بریندار؛ ئەوەی لە کارەساتێکدا (کارەساتی ماشێن، سووتمان، تەقینەوە و...) لەشی تووشی برین و شکان بووە ‹مجروح را به بیمارستان رساندند: بریندارەکەیان گەیاندە نەخۆشخانە›.

**مجروح**[2]: *صفت.* بریندار؛ زامدار؛ برینار؛ زامار ‹سرش مجروح شد: سەری بریندار بوو›.

**مجره** / macarre/: [عربی] *اسم. [قدیمی]* کادز؛ کاکێشان؛ سپیایی ناوەندی ئاسمان لە شەودا.

**مجری** / mecrî ، ـها/: *اسم.* مجری: ۱. جۆرێک

میوه که سەرەکەی دەقەڵشێ و تووەکانی لێوە دەرژێ ۲. سنۆقڵە؛ سندووقی چکۆلە زۆرتر جێ خشڵ و زەنبەر.

**مجری** / mocrā/ ☜ **مُجرا**

**مجــــری**[1] / mocrî ، ـهـا؛ ـان/: [عربـی]/اسـم. بەڕێوەبەر؛ بەڕێوبـەر؛ کەسـێ کـە بەرنامـە یـان دەستوورێک بەڕێوە دەبا ‹مُجری هنوز نرسیده است: بەڕێوەبەر هێشتا نەگەیشتوە›.

**مجری**[2]: صفت. بەڕێوەبەر؛ بەڕێوبەر ‹مُجری اخبار تلویزیون: بەڕێوەبەری هەواڵەکانی تەلەڤیزیۆن›.

**مجریه** / mocrîyye/: [عربی] صفت. بەڕێوبـەری؛ بەڕێوەبەری ‹قوەی مجریه: هێزی بەڕێوبەری›.

**مجزا** / mocazzā/: [عربـی] صفت. جیـا؛ جـوێ؛ جودا؛ جگا: **مُجزّی**

**مجزی** / mocazzā/: [عربی] ☜ **مجزّا**

**مجسم** / mocassam/: [عربی] صفت. بەرجەسـت؛ تەندار؛ وەبەر چاو هاتوو؛ وەبەر چاو هێنراو.

◘ **مجسم کردن**: وەبەر چاو هێنان؛ هێنانە پێش چاو؛ هاوردنە بەر چاو. هەروەها: **مجسم بودن؛ مجسم شدن**

**مجســـمه** / mocassame ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ۱. هەیتال؛ کۆتەڵ؛ هەیکەڵ؛ پەیکەر؛ مـەیماق؛ موجەسەمە؛ وێنەی مرۆڤ، گیا و گیانەوەر کە لە ماکێـک داڕێژرابـێ ۲. نوێنـە؛ وێنـەی تـەواو و بـێ کـەم و کـووڕی ‹مجسـمەی تقوا: نوێنـەی لـە خواترسی›.

**مجسمەساز** / mocassamesāz ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسـی]/اسـم. پەیکـەرتاش؛ هەیکـەڵ‌تـراش؛ پەیکەرچێکر؛ کۆتەڵ ساز بە کانزا و دار.

**مجســـمەســازی** / mocassamesāzî/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. پەیکەرتاشـی؛ کۆتـەڵ‌سـازی: ۱. هونەر یان لێزانی چێکرن و تاشینی پەیکەر ۲. کار و پیشەی پەیکەرتاش.

**مجعد** / moca'ad/: [عربی] صفت. لوول؛ لوور؛ پـڕ و پێچ؛ گرژ و لوول؛ خەلـەک ‹مـوی مجعـد: قـژی لووول›.

**مجعول** / mac'ûl/: [عربـی] صـفت. هەڵبەسـتراو؛ هەڵبەسراو؛ چرووک.

**مجلات** / macallāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مجلّه**

**مجلد**[1] / mocallad ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. بەرگ؛ جلد؛ یەکەی ژماردنی پەرتووک.

**مجلد**[2]: صفت. بەرگدار؛ بەرگ‌گیراو.

**مجلــس** / macles ، ـهـا؛ مجالس/: [عربـی]/اسـم. مـەجلیس: ۱. کـۆڕ؛ جێگـەی کـۆ بوونـەوە و دانیشتنی تاقمێک ۲. کۆڕ؛ ئەنجومـەن؛ جڤـات؛ کۆڕگە؛ شوێنی کۆ بوونەوەی ئەندامەکانی هێزی قانوون‌دانـەر ۳. کـۆڕی بریکـاران؛ دامـەزراوەی قانوون دانان.

◘ **مجلس تذکر**: کۆڕی بیرئانین؛ کـۆڕی ڕێزنـان لە مردوو.

**مجلس ترحیم**: پرسە؛ پرس؛ فاتحەخوانی؛ کـۆ بوونەوەی خەڵک لە شوێنێکی سەرگیراودا بۆ تازیەداری و سەرەخۆشی: **مجلس ختم**

**مجلس ختم** ☜ **مجلس ترحیم**

**مجلس سنا** ☜ **سنا**

**مجلس‌آرا** / maclesārā ، ـیان/: [عربـی/ فارسـی] صفت. کۆڕگێڕ؛ گۆبەنوان؛ گۆبەندگێڕ؛ کـۆڕڕازێن؛ کۆڕخۆشکەر؛ بەزمگێڕ؛ هۆی گەرم‌وگـوڕ بـوونی کۆڕ: **مجلس‌آرا؛ مجلس‌افروز-۱**

**مجلــس‌آرای** / maclesārāy/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **مجلس‌آرا**

**مجلــس‌آرایـــی** / maclesārāyî ، ـهـا/: [عربـی/ فارسی]/اسم. کۆڕگێـڕی؛ گۆبـەنوانی؛ کـۆڕڕازێنی؛ کۆڕخۆشکەری؛ بەزمگێڕی.

**مجلــس‌افــروز** / macles'afruz ، ـان/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. ۱. ☜ **مجلــس‌آرا** ۲. *[موسـیقی]* گۆشەیەک لە دوو دەستگای شوور و ماهووردا.

**مجلسی** / maclesî/: [عربی] صـفت. مەجلیسـی: ۱. کۆڕی؛ سەر بە مـەجلیس ‹موسیقی مجلسـی: مووسیقای مەجلیسی› ۲. میـوانی؛ شـیاوی کـۆڕ

‹لباس مجلسی: جل‌وبەرگی میوانی›.

**مجلسین** / macleseyn/: [عربی]/اسم. دووکوڕ؛ دووئەنجومەن (وەک شوورا و سەنا).

**مجلل** / mocallal/: [عربی] صفت. بەشکۆ؛ ڕازاوە؛ بە شان و شکۆ ‹عروسی مجلل: زەماوەندی بەشکو›.

**مجله** / macalle ، ـها؛ مجلات/: [عربی]/اسم. گۆڤار؛ گۆوار؛ کۆڤار؛ بەلاڤۆکی غەیرە ڕۆژانە (حەفتانە، مانگانە، دوومانگانە و...).

▣ **مجلەی تلویزیونی**: گۆڤاری تەلەفیزیۆنی؛ بەرنامەی تەلەڤیزیۆنی پڕ لە بابەتی جۆراوجۆر. هەروەها: **مجلەی رادیویی**

**مجلەی سینمایی**: گۆڤاری سینەمایی؛ گۆڤارێک بۆ هونەر و تیکنۆلۆژی سینەما. هەروەها: **مجلەی ورزشی؛ مجلەی هنری؛ مجلەی کودکان؛ مجلەی سیاسی**

**مجمره** / mecmare/: [عربی] ☜ **آتشدان-۴**

**مجمع** / macma' ، ـها؛ مجامع/: [عربی]/اسم. کۆڕ: ۱. کۆگە؛ دانیشگە؛ نیشتنگا؛ مەکۆ؛ کۆگا؛ شوێنی کۆ بوونەوە بۆ وتوویژ ۲. خودی ئەو کۆمەڵە ۳. دامەزراوەیەک بۆ بەڕێوە بردنی کارێکی تایبەت.

▣ **مجمع عمومی**: کۆڕی گشتی؛ شوێنی کۆ بوونەوەی هەموو ئەندامانی بەشدارگەیەک.

**مجمع‌الجزایر** / macma'ocazāyer/: [عربی]/اسم. چەن دوورگەی گەورە و بچووکی لە پەنا یەک.

**مجمعه** / macma'e ، ـها/: [عربی]/اسم. مەجمەعە؛ مەجمە؛ بەرگەش؛ سینی خڕی زۆرگەورەی کانزایی.

**مجمل** / mocmal/: [عربی] صفت. کورتە؛ پوختە؛ کورت و کرمانجی.

**مجموع** [1] / macmû'/: [عربی]/اسم. کۆ؛ سەرجەم؛ سەرکۆ؛ بەرهەڤ؛ بەرهەمی لە سەر یەک نان و کۆ کردنەوە.

**مجموع** [2]: صفت. *[نامتداول]* کۆما؛ کۆکراوە؛ کۆوەبوو؛ کۆکراوە لە یەک جێگادا.

**مجموعاً** / macmû'an/: [عربی] *قید*. تێکڕا؛ بە گشتی؛ سەرکۆ؛ سەرجەم؛ سەریەک؛ بەکۆ؛ وێکڕا؛ پێکەوە؛ سەرهەم؛ لە سەر یەک؛ گردەوە؛ یۆوە ‹مجموعاً همه را بردند: تێکرا گشتیان برد›.

**مجموعه** / macmû'e ، ـها/: [عربی]/اسم. کۆمەڵە؛ کۆمەڵ؛ کۆ: ۱. سەرجەم؛ تێکڕا؛ ئەو شتانەی سەر بە کەس یان بابەتێکن و لە شوێنێکدا کۆ کراونەتەوە ‹مجموعەی آثار هزار: سەرجەمی بەرهەمەکانی هەژار› ۲. بەرهەڤۆک؛ کولیکسیۆن؛ ژمارەیەک شتی سەر بە یەک کە بۆ لێکۆڵینەوە، سەرگەرمی یان ڕانواندن کۆکراونەتەوە ‹مجموعەی تمبر: بەرهەڤۆکی تەمر› ۳. جڤاک؛ شەماتە ‹مجموعەی مسکونی: کۆمەڵە خانوو› ۴. *[قدیمی]* مەجمەعە؛ سینی گەورەی کانزایی.

**مجنون** / macnûn ، ـها؛ مجانین/: [عربی] صفت. *[ادبی]* مەجنوون؛ لێوە؛ دین؛ شێت.

**مجوز** / mocavvez ، ـها/: [عربی]/اسم. بڕوانامە؛ ئیجازەنامە.

**مجوس** / macûs ، ـها؛ ـان/: [معرب از آرامی از اوستایی]/اسم. *[قدیمی]* مەجووس؛ زەرتوشتی؛ زەردەشتی (لە زمانی عەرەبدا).

**مجوف** / mocavvaf/: [عربی] صفت. هلۆل؛ کلۆر؛ قرۆل؛ ناوبەتاڵ؛ ناوخاڵی؛ بۆش؛ زۆز؛ دڵیٚهاڵی ‹آجر مجوف: خشتی هلۆل›.

**مجهز** / mocahhaz/: [عربی] صفت. تەکووز؛ تەیار؛ ساز و ئامادە بە کەرستە و ئامێری پێویستەوە.

**مجهول** / machûl ، ـات/: [عربی] صفت. ۱. نامەعلووم؛ نادیار؛ بانێریای؛ نەزانراو ۲. نەناس؛ نەژناس؛ نەناسراو ‹فرد مجهول: کەسی نەناسراو› ۳. ☜ **فعل مجهول، فعل**

**مجهولات** / machûlāt/: [عربی]/اسم. نەزانراو؛ نەناسراو؛ سەرجەم ئەو شتانەی نەناسراون ‹در مورد فضای کیهانی مجهولات ما بیش از معلومات

ماست: لەمەڕ بۆشایی ئاسمانەوە نەناسراومان زۆرترە لە ناسراو›.

**مجهول‌الهویه** / machûlolhovîy(y)e، ـها/: [عربی] *صفت*. بێ‌ناو؛ بێ‌ناو و نیشان؛ گومناو؛ نەناسراو ‹جسد مجهول‌الهویه‌ای در یک ساختمان متروکه پیدا شد: تەرمێکی نەناسراو لە مێشەمڕێکدا دۆزرایەوە›.

**مجید**/ macid/: [عربی] *صفت*. گەورە؛ بەرز؛ والا؛ بە شان و شکۆ.

**مجیز** / macîz/: [از عربی]*اسم*. *[گفتاری]* چاپلووسی؛ زمان‌چەوری؛ شالووزی.

▣ **مجیز کسی را گفتن**: بە بالای کەسێکدا هاتن؛ بە کەسێکدا هەڵگوتن؛ زمان‌چەوری‌کردن بۆ کەسێک ‹او انتظار داشت مجیزش را بگویی: بە تەما بوو بە بالایدا بێی›.

**مچ** / moč، ـها/: *اسم*. مووچ؛ موچ؛ مەچ؛ موچە:

١. خرتکە؛ وردەلە؛ کەرمچک: *(الف)* زەندک؛ مەچەک؛ بازندە؛ باق؛ ڤەرشک؛ کابچک؛ ئەرەح؛ جومگەی نێوان دەست و قۆڵ *ب)* قولاپ؛ قولاپە؛ پلپووز؛ جومگەی نێوان بەلەک و قاچ

٢. ئەو بەشە لە جل کە مەچەک دادەپۆشێ.

▣ **مچ انداختن**: دەس خەفاندن؛ مەچەک خستن؛ زۆر دەست‌کردن؛ جۆرێ زۆرانی دەست و مەچەکە لە نێوان دوو کەسدا بەم شێوە کە بەرامبەر یەک دادەنیشن و ئانیشکیان، زۆرتر لە سەر مێزێک دادەنێن و لەپی دەستیان لێک قفڵ دەکەن. ئەمجار هەر کام بە هێزی باسک و دەستی، زۆر دەکا پشتی دەستی ئەوی‌تر لە زەوی بدا.

**مچ کسی را گرفتن**: *[کنایی]* بە سەر کەسێکدا چوون؛ بە مل کەسێکا چوون؛ بە کاری نهێنی کەسێک زانین؛ دیتنی لە ناکاوی کەسێک لە کاتی کردنی کارێکدا (زۆتر نارەوا) ‹خوب مچت را گرفتم، پس تو این کار را می‌کردی؟: چاک بە سەرتدا هاتم، کەوابێ ئەوە تۆ بووی ئەم کارەت دەکرد؟›.

**مچاله** / močāle/: *صفت*. مچۆلە؛ مچولە؛ مێچۆلە؛ مێچۆلکە؛ کلۆف؛ گلۆف؛ گولۆف؛ گلفچ؛ قرمچ؛ چرچ و لۆچ؛ لۆچ و پۆچ؛ بۆژیاگ:

١. دۆخی ئەوەی لە بەر تەوژم، بیچمی تێکچووە و خڕ بۆتەوە و چۆتە یەک ‹کاغذ را مچاله کرد و دور انداخت: کاغەزەکەی مچولە کرد و بڕکی دا›

٢. چۆنیەتی لە بەر ئێش و چەرمەسەرە یان پیری کۆم بوونەوە و هەڵچرچان.

▣ **مچاله کردن**: گلۆفین؛ گولۆفین؛ گولۆفتین؛ هەڵگولۆفین؛ هەڵگلۆفین؛ کولۆفتن؛ گلوچاندن؛ گلفچاندن؛ قرمچاندن؛ مچاندن؛ قورمچاندن؛ فەرکاندن؛ مووچنایوە؛ ئەوەمووچنەی؛ قرچاندن؛ قرچانن؛ چرچ کردن؛ پەرەخاندن؛ ولین؛ مەرسین؛ گولۆف‌کردن؛ هەڵشلەپاندن؛ هەسکاندن؛ هەڵپشاوتن؛ هەڵپشافتن؛ پشاوتن؛ بە تەوژم لێک‌گووشان و گۆڕانی بیچمی شتێک: هەروەها: **مچاله شدن**

**مچ اندازی** / moč'andāzî/: *اسم*. کاری مەچەک خستن؛ دەس خەفاندن؛ زۆرانبازی دەست و مەچەک کردن.

**مچ‌بند** / močband، ـها/: *اسم*. مووچەوانە؛ مووچ‌پێچ؛ مووچ‌بەن؛ مەچەک‌بەند؛ نەوارێکی لە چەرم یان پارچەی کێشباف کە بۆ پاراستن یان بەرگری لە ئێش، مووچی پێ دەپێچن.

**مچپوش** / močpûš، ـها/: *اسم*. سەرقۆڵ؛ سەردەس؛ پاژی سەردەستی جلک (وەک قۆڵی کراس و کۆت و سۆرانی کەوا).

**مچ پیچ** / močpîč، ـها/: *اسم*. ١. پووزەوانە؛ پووزەوانێ؛ پووزەوان؛ زەنگاڵ؛ زەرگاڵ؛ لاچین؛ پێتاو؛ پێتاوە؛ پاتاوە؛ بەلەک‌پێچ؛ پاپێچ؛ دۆلاغ؛ دۆلاخ؛ نەوارێکی لە پارچەی ئەستوور کە لە خوار ئەژنۆوە بە سەر شواڵ و پاتۆڵدا دەبەسرێ و تا بان کەوش دادەپۆشێ ٢. مووچ‌بەن؛ موچ‌پێچ؛

دەرلنگی پاتۆڵ و شواڵ کە بە کێش یان دوگمە لە قولاپەی پێ توند دەکرێت ۳. مەچەکبەند؛ موچبەن؛ جومگەپێچ.

**مچ‌گیری** / močgîrî ، ـها/: *اسم.[گفتاری]* کار یان ڕەوتی پێزانین و دەرخستنی پیلانێکی نهێنی.

**مچل** / mačal/: *صفت.[گفتاری]* گاڵتەجاڕ؛ گەپچاڕ؛ بەر تانە و گەپ و گاڵتەی خەڵک.

**مچلی** / mačalî/: *اسم.* گاڵتەجاڕی؛ ترانە؛ دۆخی کەوتنە بەر گەپ و گاڵتەی دیترانەوە.

**مچول** / mučûl/ ☜ **موچول**

**مچی** / močî/: *صفت.* مووچی؛ موچی؛ تایبەت بە مەچەک ‹ساعت مچی: کاتژمێری مووچی›.

**محابا** / mohābā/: [از عربی]*اسم.[ادبی]* ۱. ترس؛ سام؛ هەراس ۲. هەمەت؛ فەدی؛ فهێت؛ ڕێز؛ چاودێری؛ ئاکاری گونجاو لە هەمبەر کەس یان شتێکەوە ۳. پشتیوانی؛ پشتگری.

**محاجه** / mohācce ، ـها/: [عربی]*اسم.* دەمەدەمێ؛ مشتومڕ؛ دەمەقاڵە؛ دەمەقاڵێ؛ دمەقاڵێ؛ دەمەقڕە؛ چەکچنە؛ قسە و باسی هاوڕێ لەگەڵ شەڕ و چەقەدا.

**محاذات** / mohāzāt/: [عربی]*اسم.[ادبی]* ئاست؛ بەرامبەر؛ ڕوودەڕوو؛ ڕووبەڕوو؛ ڕوولەڕوو؛ دۆخ یان چۆنیەتی بەرامبەر بوون؛ ڕووبەڕوو بوون ‹صندلی‌ها را بە مُحاذات نردەها چیدە بودند: سەندەڵیەکانیان لە ئاستی نەردەکانەوە چنیبوو›.

**محاذی** / mohāzî/: [عربی] *صفت.[ادبی]* بەرامبەر؛ بەرانبەر؛ ڕووبەڕوو؛ وەراوەر؛ ڕوولەڕوو؛ ئاست ‹قلعە محاذی قلەی کوە بود: قەڵاکە بەرامبەری لووتکەی کێوەکە بوو›.

**محارب**[1] / mohāreb ، ـان؛ ـین/: [عربی]*اسم.* *[اسلام]* موحاریب؛ کەسێ کە دژی دەستووری دین یان حکومەتی ئیسلامی وەستاوەتەوە و دەبێ بکوژرێ.

**محارب**[2] / ـان؛ ـین/: *صفت.[ادبی]* شەڕخواز؛ بەشەڕهاتوو.

**محاربات** / mohārebāt/: [عربی] جمعِ ☜ **محاربه**

**محاربه** / mohārebe ، ـها؛ محاربات/: [عربی]*اسم.* *[قدیمی]* ۱. شەڕ؛ شەڕ و شۆ؛ سواژ ۲. کاری بشێوە نانەوە؛ ئاژاوە خۆش‌کردن.

**محارم** / mahārem/: [عربی] جمعِ ☜ **مَحرَم**

**محاسب** / mohāseb ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]*اسم.* ۱. ژمێریار؛ ژماریار؛ ژمارەگەر؛ هۆمارتۆخ؛ حیسابدار ۲. ژمارکەر؛ حیسابکەر؛ کەسێ کە دەژمێرێ.

**محاسبات** / mohāsebāt/: [عربی]*اسم.* ۱. سەرجەمی کاروباری تایبەت بە ژماریاری و تاوتوێکردنی حیسابگەل ۲. سەرجەمی حیسابی ڕێکخراوە یان کەسێک لە ڕەوت یان ماوەیەکدا ۳. جمعِ ☜ **محاسبه**

**محاسبه** / mohāsebe ، ـها؛ محاسبات/: [عربی]*اسم.* کار و ڕەوتی ژماردن؛ حسێب‌کردن.

**محاسن** / mahāsen/: [عربی]*اسم.* ۱. چاکە؛ باشی؛ خاسی ۲. *[ادبی]* ڕیش؛ ڕدێن ‹محاسن بلندی داشت: ڕیشێکی درێژی هەبوو›.

**محاصره** / mohāsere ، ـها/: [عربی]*اسم.* گەمارۆ؛ ئابلۆقە؛ ئابلووقە؛ چاکمە؛ کارەڕەهاتی دەورەدان و نەهێشتنی پێوەندی شوێنێک لەگەڵ دەور و بەریدا.

▣ **محاصره‌ی اقتصادی**: ئابلۆقەی/ گەمارۆی ئابووری؛ بەرگری‌کردن لە مامەڵە و دان‌وستانی وڵاتێک لەگەڵ وڵاتانی‌تر.

**محاصره‌ی نظامی**: گەمارۆی چەکداری؛ چوار لا گرتن و بەستنی هەموو ڕێگایەک بە هێزی چەکداری بە مەبەستی بەرگری لە یارمەتی پێ‌گەیشتن و هەڵاتنی دانیشتوان.

**محاضر** / mahāzer/: [عربی] جمعِ ☜ **مَحضَر**

**محاط** / mohāt/: [عربی] *صفت.* ۱. دەورگیراو؛ لێ‌گیراو ۲. دەوردراو.

**محاطی** / mohātî/: [عربی] *صفت.* دەورگیراو.

**محافظ** / mohāfez ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. پارێزەر؛ پارێزکار؛ ئاگادار؛ نیگادار؛ ئەوەی کەس یان شتێک دەپارێزێت ‹پلک محافظ چشم است: پێلوو پارێزەری چاوە›.

**محافظت** / mohāfezat ، ـها/: [عربی]/اسم. چاوەدێری؛ نیگاوانی؛ چاودێری؛ ڤرسهاندن؛ پارێزکاری؛ کار و ڕەوتی پاراستن: *الف)* بە مەبەستی بەرگری‌کردن لە ون بوونی شتێک *ب)* بە مەبەستی بەرگری‌کردن لە زیان بینینی کەسێک.

**محافظه‌کار** / mohāfezekār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. خۆپارێز: ۱. *[سیاسی]* کۆنپارێز؛ خۆلادەر لە گۆڕانکاری ۲. ڕەوک و دوورەپەرێز لە مەترسی. هەروەها: **محافظه‌کاری**

**محافل** / mahāfel/: [عربی] جمعِ ☜ **محفل**

**محاق** / mohāq(q)/: [عربی]/اسم. *[نجوم]* دۆخی مانگ لە سێ شەوی ئاخری مانگی کۆچیدا کە یەکجار تەسکە و نابیندرێ.

**محاکم** / mahākem/: [عربی] جمعِ ☜ **مَحکَمه**

**محاکمات** / mohākemāt/: [عربی] جمعِ ☜ **محاکمه**

**محاکمه** / mohākeme ، ـها؛ محاکمات/: [عربی] اسم. لێپرسینەوە: ۱. *[حقوق]* کار و ڕەوتی دادگەیی/ دادکایی کردن؛ دەرخستنی تاوانباری یان بێ‌تاوانی کەسێک بە پرسیار لێ‌کردن و پێڕاگەیشتن بە بەڵگە و نیشانەوە ۲. *[گفتاری]* باس‌وخواس‌کردن؛ سین‌وجیم‌کردن؛ پرس‌وجۆی زۆر لە کەسێ کردن.

▣ **محاکمه کردن**: دادگایی/ دادگەیی کردن؛ دایزکرن ‹او را در دادگاه نظامی محاکمه کردند: لە دادگای چەکداریدا دادگاییان کرد›. هەروەها: **محاکمه شدن**

**محال** / mahāl(l) ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. *[قدیمی، جغرافیا]* دەڤەر؛ ناوچە؛ مەڵبەند.

**محال** / mahāl, mohāl ، ـات/: [عربی] صفت. دەستنەداو؛ نەشیاو؛ نەڕەخساو؛ ئەستەم؛ ناکردنی ‹کار محال: کاری دەستنەداو›.

**محالات** / mahālāt, mohālāt/: [عربی]/اسم. دەستنەداوان؛ نەڕەخساوان؛ کارگەلی نەکردنی؛ بەرانبەر: **ممکنات**

**محاورات** / mohāverāt/: [عربی] جمعِ ☜ **محاوره**

**محاوره** / mohāvere ، ـها؛ محاورات/: [عربی]/اسم. دەمەتەقە؛ دەمەتەقێ؛ وت‌وویژ؛ گفت‌وگۆ؛ مچلگە؛ باس.

**محاوره‌ای** / mohāvere'î/: [عربی] صفت. سەرزارەکی؛ وت‌وویژی؛ گفت‌وگۆیی؛ لە سەر دەم و زمان ‹اصطلاحات محاوره‌ای: زاراوەگەلی سەرزارەکی›.

**محب** / moheb(b) ، ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* خۆشویست؛ خوازیار؛ حەزلێکەر؛ سۆزدار.

**محبت** / mahabbat, mohebbat ، ـها/: [عربی] /اسم. مۆڤەت؛ مۆبەت؛ مهەبەت: ۱. ڤیان؛ عیشق؛ ئەوین؛ مێر ۲. خۆشەویستی؛ خۆشویستی؛ خوەشەویسی؛ وەشەویسی؛ دلۆڤانی؛ سۆزداری؛ میهرەوانی.

▣ **محبت داشتن**: خۆش ویستن؛ خۆش گەرەک بوون؛ هەباندن؛ وەش سیای؛ سۆزداری کردن ‹جنابعالی همیشه به او محبت داشته‌اید: ئێوە هەمیشە ئەوتان خۆش ویستووە›.

**محبت کردن**: دلۆڤانی‌کردن ‹این بار هم محبت کنید و به دادش برسید: ئەمجارەش دلوڤانی بکەن و فریای کەون›.

**محبت‌آمیز** / mahabbatāmîz, mohebbat-/: [عربی/ فارسی] صفت. دۆستانە؛ خۆشەویستانە؛ خۆشویستانە؛ بە دلۆڤانی ‹لحن محبت‌آمیز: زمانی دوستانە›.

**محبس** / mahbas ، ـها/: [عربی]/اسم. گرتووخانە؛ گرتیمانە؛ بەندیخانە؛ زیندان.

**محبوب** / mahbûb/: [عربی] صفت. ۱. دڵخواز؛

دڵواز؛ خۆشەویست؛ خوەشەویس؛ وەشەویس؛ لەبەردڵان؛ وەشەسیا ‹قهرمان محبوب: قارەمانی دڵخواز› ٢. *[مجازی]* نازدار؛ دڵبەر؛ ماشۆق؛ گراوی.

**محبوبیت** / mahbûbîyyat ، ـها/: [عربی] *اسم*. خۆشەویستی؛ بەردڵ کەوتوویی؛ وەبەردڵانی؛ بار و دۆخی خۆشەویست بوون.

**محبوس** / mahbûs ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. زیندانی: ١. دیل؛ بەندی؛ گیراو؛ لە بەندیخانە ڕاگیراو ٢. گیر؛ گیرۆدە؛ قەتیس؛ گرفتار؛ زیندانی؛ بێدەرەتان ‹دو ساعت در آسانسور محبوس بودم: دوو کاتژمێر لە ئاسانسۆردا قەتیس بووم›.

**محتاج** / mohtāc ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. ئاتاج؛ نیازمەند؛ بەنیاز.

**محتاط** / mohtāt/: [عربی] *صفت*. خۆپارێز؛ پارێزکەر؛ بە پارێز؛ دوورنواڕ.

**محتاطانه** / mohtātāne/: [عربی / فارسی] *قید*. خۆپارێزانە؛ بە پارێزەوە؛ لە ڕووی پارێزەوە.

**محترفه** / mohtarefe/: [عربی] *اسم*. *[قدیمی]* کاسبکاران؛ پیشەوەران.

**محترقه** / mohtareqe/: [عربی] *صفت*. ١. ئاورساز؛ سووتماک ٢. ئاورگر؛ ئاوربەر؛ گربەر؛ گڕگر؛ ئاگربەر.

**محترم** / mohtaram ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. بەڕێز؛ ڕێزدار؛ بەڕی؛ بەڕوو؛ شیاوی ڕێز ‹پیرمرد محترم: پیرەمێردی بەڕێز›.

**محترماً** / mohtaraman/: [عربی] *قید*. بەڕێزەوە؛ لە ڕووی ڕێزەوە ‹محترما عرض می‌شود: بە ڕێزەوە ڕادەگەیێنرێ›.

**محترمانه**[1] / mohtaramāne/: [عربی / فارسی] *صفت*. ڕێزدارانە؛ بەڕێزانە؛ وێڕای ڕێز؛ لەگەڵ ڕێزدا ‹نامەی محترمانه: نامەی ڕێزدارانە›.

**محترمانه**[2]: *قید*. بەڕێزەوە؛ بەڕێزانە؛ وێڕای ڕێز ‹محترمانه به او جواب داد: بەڕێزەوە وەلامی داوە›.

**محتسب** / mohtaseb ، ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم*. *[قدیمی]* شارەوان؛ شارەداری کۆن کە بەری بە کاری ناڕەواش دەگرت.

**محتشم** / mohtašam ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* شکۆدار؛ بە هەیبەت؛ بە شکۆ؛ بە شان و شکۆ.

**محتضر** / mohtazer ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. گیانەلاو؛ سەرەمەرگ؛ ئاویلکە؛ گیان کەنشت؛ لە سەرەمەرگدا.

**محتکر** / mohtaker ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. پاوانکار؛ مالگرەوە؛ مالگر؛ کۆوەکەری بە تەمای داهاتوو.

**محتلم** / mohtalem/: [عربی] *صفت*. شەیتانی؛ ئاوهاتووەوە لە خەودا.

**محتمل** / mohtamal, mohtamel/: [عربی] *صفت*. ڕێ‌تێ‌چوو؛ بووزخۆر ‹محتمل است فردا ببارد: ڕێ‌تێ‌دەچی بەیانی بباری›.

**محتملاً** / mohtamalan, mohtamelan/: [عربی] *قید*. ڕەنگە؛ ڕەنگا؛ لەوانەیە؛ دەشێ؛ شایەکێ؛ شایەتێ؛ شایەتا؛ شایەت؛ گاهەز.

**محتوا** / mohtavā ، ـها؛ محتویات/: [عربی] *اسم*. ناوەرۆک؛ ناورۆکە؛ ناوەڕۆک؛ هەش؛ ناوئاخن: ١. ئەوەی لە ناو شتێکدایە ‹محتوای کیف: ناوئاخنی کیف› ٢. کورەک؛ کاکڵ؛ کاکڵە ‹من با شیوه‌ی زدنش مخالفم، نه با محتوای حرفهایش: من شێوازی قسە کردنیم بە دڵ نیە، نەوەک ناودروکی قسەکانی›؛ **محتوی**

**محتوم** / mahtûm/: [عربی] *صفت*. مسۆگەر؛ بەبێ سێ‌ودوو.

**محتوی** / mohtavā/: [عربی] ☜ **مُحتَوا**

**محتوی** / mohtavî/: [عربی] *صفت*. داگر؛ لەبەرگر؛ لە خۆگر؛ لە خۆداگر ‹این کتاب محتوی چند بخش است: ئەم کتێبە داگری چەن بەشە›.

**محتویات** / mohtavîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مُحتَوا**

**محجبه** / mohaccabe/: [عربی] *صفت*. بەحیجاب؛

داپۆشراو ‹یک دختر محجبه با شما کار دارد: کچێکی بەحیجاب کاری پێتانە›.

**محجر** / mahcar/: [عربی] ☜ **مَعجَر**

**محجوب** / mahcûb/: [عربی] *صفت*. ۱. شەرمن؛ شەرمین؛ شەرمێون؛ بەشەرم؛ بەحەیا؛ ڕووگر؛ فهێتکار؛ فەدیکار؛ فەهۆ؛ فەهیتۆ؛ فەهیتۆک؛ فەدیۆک ۲. *[نامتداول]* داپۆشراو؛ بەحیجاب.

**محجور** / mahcûr/: [عربی] *اسم*. *[قدیمی]* نەبەگە؛ کەسی پێگەییوی مێشک‌کاڵ کە بە حوکمی دادگا دەخرێتە ژێر سەرپەرشتی کەسێکی ترەوە. هەروەها: **محجوری**

**محدب** / mohaddab/: [عربی] *صفت*. قۆقز؛ کۆم؛ کوور.

**محدب‌الطرفین** / mohaddabottarafeyn/: [عربی] ☜ **دوکوژ**

**محدث** / mohaddes ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم*. حەدیس‌زان؛ زانا لە زانستی حەدیسدا.

**محدث** / mohdas/: [عربی] *صفت*. ۱. *[نامتداول]* تازە؛ نۆ؛ نوێ؛ نفت و نەو ۲. *[فلسفه]* نووژەن؛ دروست‌بوو؛ بەدیهاتوو. بەرانبەر: **قدیم**

**محدود** / mahdûd/: [عربی] *صفت*. ۱. سنووردار؛ ڕادەدار؛ بە کەوشەنی دیاریکراوەوە ۲. کەم؛ پێچ؛ کێم ‹قدرت محدود: دەسەلاتی کەم› ۳. کورت؛ کۆتا (بۆ کات) ‹عُمر محدود: تەمەنی کورت›.

▣ **محدود شدن به جایی**: گەیشتن بە جێگایێ؛ هاوسنوور بوون لەگەڵ جێگایێکدا.

**محدود شدن به چیزی**: تایبەت بوون بە شتێکەوە.

**محدوده** / mahdûde ، ـها/: [عربی] *اسم*. زێوار؛ زێوارە: ۱. *[نامتداول]* سنوور؛ کەوشەن؛ مەرز ۲. کەنێرە؛ لێوار؛ قەراغ ‹محدوده‌ی شرقی شهر: زێوارەی ڕۆژهەلاتی شار›.

▣ **محدوده‌ی شهری**: زێواری شاری؛ ئەو بەشە لە زەوی یان ماڵ کە لە سەر شار دەژمێردرێن و شارەداری خزمەتی پێویستی دەداتێ.

**محدودیت** / mahdûdîyyat ، ـها/: [عربی] *اسم*. ۱. بار و دۆخی سنووردار بوون ۲. تەنگاوی؛ بێدەرەتانی.

**محذور** / mahzûr ، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم*. پەرێز؛ بەرگر؛ لەمپەر؛ کۆسپ؛ گەبل؛ ئەوەی دەبێتە هۆی پارێزکردن لە شتێک بەتایبەت لە کردنی کارێک: **محظور**

**محراب** / mehrāb ، ـها/: [عربی] *اسم*. میحراب؛ میحراو؛ مێراو: ۱. جێگەی پێش‌نوێژ لە مزگەوتان ۲. بەشێک لە نوێژگە (مزگەوت، کنێسە، ئاتەشگا) کە نوێژکەران ڕووی تێدەکەن ‹محراب مسجد: میحراوی مزگەوت›.

**محرر** / moharrer ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم*. *[قدیمی]* ۱. نووسەر ۲. مونشی؛ نوویسکار.

**محرز** / mohraz/: [عربی] *صفت*. مسۆگەر؛ مسەوگەر؛ بێ‌شک ‹پیروزی آنان محرز است: سەرکەوتنیان مسوگەرە›.

**محرف** / moharraf/: [عربی] *صفت*. دەسکاری‌کراو؛ دەستتێوەردراو؛ دەستتێبراو.

**محرق** / moharreq/: [عربی] *صفت*. ۱. بسووت؛ گڕبەر؛ ئاورگر؛ ئاورگە؛ سووتماک ۲. سووتێنەر.

**محرقه** / mohreqe/: [عربی] *اسم*. *[قدیمی]* گرانەتا؛ گرانتا؛ گرانەتێ؛ ڕەش‌گرانی؛ ئێشاگران؛ تیفووس.

**محرک**[1] / moharrek ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم*. هاندەر؛ بزوێنەر؛ دنەدەر؛ فێتکار؛ هەڵخڕێنەر؛ ئەوەی دەبێتە هۆی هاندان و بزووتنەوە ‹محرک او در این عمل شناخته شد: هاندەری ئەو لەم کارەدا ناسرا›.

**محرک**[2]: *صفت*. بزوێنەر؛ بزوێنە؛ هێفۆتە؛ بزۆک؛ لڤێنەر؛ جووڵێنەر؛ داینەمۆ؛ جووڵێنە: ۱. گەڕێنەک؛ بگێڕ ‹نیروی محرک موتور: هێزی بزوێنەری موتور› ۲. دنەدەر؛ هانەدەر؛ هەڵخڕێن؛

هەڵخڕێنەر؛ لێهاتوو لـە هانـدان یـان فریودانـدا ‹سـخنان محـرک جوانـان: قسـه و باسـی دنـەدەری لاوان›.

**محرم** / mahram ، ـها؛ ـان؛ ـین؛ مَحارِم/: [عربـی] *صفت.* مەحرەم: ۱. *[فقه]* تایبەتمەنـدی خزمێـک کـە ژن و ژنخـواز لەگەڵـیدا حـەرام دەکـا ۲. *[فقـه]* تایبەتمەنـدی ئـەو کەسـەی بـە پێـی قانوونی شەرع پێویست ناکا ژن سەر و ڕووی لێ داپۆشێ ۳. ڕازدار؛ جێمتمانه.

**محرم**[1] / moharram/: [عربـی] *اسـم.* موحـەڕڕەم؛ مانگی سەرەتای ساڵی کۆچی ـ مانگی.

**محرم**[2] / ـات/: [عربی] *صفت.* حەرام؛ حـەرامکـراو؛ بەربەستکراو.

**محرمـات** / moharramāt/: [عربـی] *اسـم. [فقـه]* حەرامی خوا؛ هەموو ئەو شتانەی حەرامن.

**محرمانه**[1] / mahramāne/: [عربی/ فارسـی] *صفت.* نهێنی؛ پەنامەکی ‹سخن محرمانه: قسەی نهێنی›.

**محرمانه**[2]: *قید.* بە نهێنی؛ پەنامەکی؛ بـە دزیـەوە ‹محرمانه با هم ملاقات می‌کردند: بە نهێنیەوە چاویان بەیەک دەکەوت›.

**محرمیـــت** / mahramîyyat/: [عربـــی] *اســـم.* مەحرەمەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی مەحرەم بوون.

**محروم** / mahrûm ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی] *صفت.* بێبەش: ۱. بێـبـەهرە؛ بـێـبـەری؛ بـێوەری ‹از دیدار او محـروم شـدم: لـە بینـینی بـێبـەش بـووم› ۲. بەشبڕاو؛ دەسکورت؛ بێ پـار؛ هـەژار ‹مـردم محروم: خەڵکی بەشبڕاو›.

**محرومیت** / mahrûmîyyat ، ـها/: [عربـی] *اسـم.* بـێبەشـی؛ دەسکـورتی؛ هـەژاری؛ دۆخ یـان چۆنیەتی بەشبڕاو بوون.

**محرومیـــتزدایـــی** / mahrûmîyyatzodāyî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کـار و ڕەوتی لـە نـاو بـردنی هۆکارەگەلی هەژاری و بێبەشی.

**محزون** / mahzûn/: [عربی] *صفت. [ادبی]* بە سۆز؛ خـەمین؛ خـەمگین؛ خـەمبار؛ کولۆڤـان ‹آواز محزون: ئاوازی بە سۆز›.

**محسـنات** / mohassanāt/: [عربـی] *اسـم.* چاکـە؛ خاسی؛ باشی ‹این کـار محسـنات زیـادی دارد: ئـەم کارە چاکەی زۆری هەیە›.

**محسوب** / mahsûb/: [عربی] *صفت.* ۱. حیسابکراو؛ ژمێردراو ‹طلب شما هم محسوب اسـت: قەرزەکـەی ئێـوەش حیسـابکراوە› ۲. بـە حسـێبهـاتوو؛ ژمێرهاتوو؛ ڕەچاوکراو؛ لە بەر چاو گیراو؛ دۆخ یا چۆنیەتی هاتنـە هـەژمار ‹او از نویسـندگان بـزرگ محسوب می‌شـود: ئەو لە نووسەرانی گەورە بە حسێب دێ›.

**محســـوس** / mahsûs ، ـات/: [عربـــی] *صـــفت.* ۱. هەسـت(پـێ)کـراو ‹گرمـای محسـوس: تـینی هەسـتپـێکـراو› ۲. ئاشـکرا؛ ڕاشـکاو؛ دیـار؛ لەبەرچاو ‹افزایش محسوس: زۆربوونەوەی ئاشـکرا›. هەروەها: **محسوس بودن؛ محسوس شدن**

**محسوسات** / mahsûsāt/: [عربی] *اسم.* بەرهەست؛ ئەوەی دەکەوێتە بەر هەست.

**محشـــر**[1] / mahšar/: [عربـــی] *اســـم.* ۱. *[اســلام]* مەحشـــەر؛ شـــوێنی پەسـلان؛ شـــوێنی سـەڵا؛ شـوێنی هەسـتانەوەی خەڵـک لـە ڕۆژا پسـاتێ ۲. *[مجازی]* چڕەبەندان؛ حەشر و حەلا؛ هەڕەمە؛ زلە؛ جێگای پڕ لە زەلە.

◘ **محشر بەپـا کـردن:** *[مجـازی]* کردنـە حەشـر؛ حەشـر و حـەلا/ حەشـر و حەلـەلا/ حەشـر و حەرەللا/ زلە/ چڕەبەندان/ هەرا و زەنا خستنە ڕێ؛ هەرا و هوریا/ چڕەبەنـدان/ هـەرا و زەنـا/ هەرا و هوریا نانەوە.

**محشر**[2]: *صفت. [گفتاری]* تەواو؛ زۆر دڵـرفێن و بـێ کەمایەسی ‹میهمانی محشری بود: میوانیەکی تـەواو بوو›.

◘ **محشر کردن:** گاڵەکردن؛ گاڵە پێکردن؛ هەرا کردن؛ حەشرکردن؛ بە باشترین شێواز بەڕێوە بردن ‹بچەهای تیم محشر کردنـد: منداڵەکانی تیم گاڵەیان کرد›.

**محشور** / mahšûr ، ـان/: [عربی] *صفت.* هاوده‌نگ؛ هه‌وال؛ هاوال؛ به هاونشینی و هاوڕێیی.

◘ **محشور شدن:** هاوده‌نگ بوون؛ هاونشین و هه‌وال بوون ‹مدتی با او محشور شد، ولی زود دلش را زد: ماوه‌یه‌ک له‌گه‌ڵی هاوده‌نگ بوو به‌ڵام زوو وه‌ڕه‌زی کرد›. هه‌روه‌ها: **محشور بودن**

**محصل** / mohassel ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* ۱. خوێندکار ۲. *[قدیمی]* خوێنده‌وار؛ خوه‌نه‌وار.

**محصور** / mahsûr/: [عربی] *صفت.* کلیده؛ ده‌ورگیراو: ۱. دیوارگیراو؛ په‌رژین‌کراو ۲. گه‌مارۆدراو؛ ته‌نگاو؛ قه‌تیس؛ په‌نگدراو ‹به وسیله‌ی نیروهای دشمن محصور شده بودند: له لایه‌ن هێزی دژمنه‌وه کلیده کرابوون›.

**محصول** / mahsûl ، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* به‌رهه‌م؛ داهات: ۱. ده‌سهات؛ ئه‌وه‌ی له ئاکامی چالاکیه‌کدا به ده‌ست هاتبێ ‹محصول کارخانه: به‌رهه‌می کارخانه› ۲. ئاژار؛ به‌ر و بووم؛ به‌ر و بوومی؛ باره‌چه؛ به‌ره؛ به‌ربێل؛ به‌ره‌بێڵ؛ ده‌رامه‌ت؛ به‌روبۆ؛ به‌رجفت؛ به‌ره‌جووت؛ به‌ره‌جفت؛ به‌هره‌ی کشت و کاڵ ‹محصول گندم: داهاتی گه‌نم› ۳. *[مجازی]* ده‌سکه‌وت؛ ئاکامی کار یان ڕه‌وتێک ‹محصول جنگ: ده‌سکه‌وتی شه‌ڕ›.

**محض** / mahz/: [عربی] *صفت.* ته‌واو؛ په‌تی؛ بێ‌خه‌وش؛ ڕه‌سه‌ن؛ ڕووت ‹تاریکی محض: تاریکایی ته‌واو›.

**محض** / mahze/: [عربی] *حرف.* ته‌نیا بۆ؛ هه‌ر بۆ؛ هه‌ر له‌به‌ر؛ بۆ خاتر؛ وه‌روو؛ بۆ؛ په‌ی؛ ژبۆ ‹محض شوخی: ته‌نیا بۆ گاڵته›.

◘ **به محض:** وێڕای؛ هاوکات؛ هه‌رکه؛ ده‌م و ده‌ست ‹به محض دیدن پاسبان فرار کرد: هه‌رکه پاسه‌وانه‌که‌ی دی هه‌ڵات›.

**محضر** / mahzar ، ـها؛ محاضر/: [عربی] *اسم.* ده‌فته‌رخانه؛ مه‌حزه‌ر: ۱. نووسینگه‌ی ڕه‌سمی به‌ڵگه ‹فردا می‌رویم محضر معامله را تمام می کنیم: به‌یانی ده‌ڕۆین بۆ مه‌حزه‌ر مامه‌ڵه‌که ده‌بڕینه‌وه› ۲. پێشگا؛ هه‌نته‌ش؛ به‌رده‌م؛ به‌رچاو؛ پێش‌چاو؛ وه‌ره‌چه‌م ‹به محضر مبارک عرض شد: له پێشگای به‌ڕێزتاندا عه‌رزم کرد›.

**محضردار** / mahzardār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم.* سه‌رده‌فته‌ر؛ نووسینگه‌دار.

**محضری** / mahzarî/: [عربی] *صفت.* مه‌حزه‌ری؛ ده‌فته‌ری؛ نووسینگه‌یی ‹سند محضری: به‌ڵگه‌ی مه‌حزه‌ری›.

**محظور**[1] / mahzûr/: [عربی] ☜ **محذور**

**محظور**[2]: *صفت.* *[نامتداول]* ناڕه‌وا؛ حه‌رام؛ قه‌ده‌غه.

**محظوظ** / mahzûz/: [عربی] *صفت.* ۱. *[نامتداول]* به‌هره‌مه‌ند؛ به‌شدار ۲. شادمان؛ خۆشحاڵ ‹از دیدن جنابعالی بسیار محظوظ شدم: له بینینتان زۆر خوشحال بووم›.

**محفظه** / mahfaze ، ـها/: [عربی] *اسم.* پاریزه‌ک؛ شوێنێکی بچووکی ده‌ورگیراو بۆ هه‌ڵگرتن و پاراستنی شتومه‌ک ‹محفظه‌ی توی دیوار: پاریزه‌کی ناو دیوار›.

**محفل** / mahfel ، ـها؛ محافل/: [عربی] *اسم.* بنکه؛ مه‌کۆ: ۱. جێگای کۆ بوونه‌وه‌ی چه‌ند که‌س ۲. خودی ئه‌و چه‌ند که‌سه (تێبینی: بنکه (محفل)، له کۆڕ (مجلس) چکۆله‌تر و خۆمانی‌تره).

◘ **محفل انس:** ۱. بنکه‌ی یاران؛ شوێنی کۆ بوونه‌وه بۆ قسه و باسی دۆستانه ۲. یاران؛ ئه‌و که‌سانه‌ی له‌وێدا کۆ ده‌بنه‌وه.

**محفوظ** / mahfûz/: [عربی] *صفت.* هه‌ڵگیراو؛ پارێزراو؛ پاراسته؛ پاراستی.

◘ **محفوظ بودن:** پارێزران ‹حق شما محفوظ است: مافی ئێوه پارێزراوه›.

**محفوظات** / mahfûzāt/: [عربی] *اسم.* بیره‌وه‌ری؛ ئه‌وی له بیردا ماونه‌ته‌وه ‹البته او بر اساس محفوظات خودش حرف می‌زد: دیاره ئه‌و به پێی بیره‌وه‌ری خۆی قسه‌ی ده‌کرد›.

**محق** / moheq(q)/: [عربی] *صفت.* حه‌قدار؛

لەسەرحەق؛ بەرحەق.

**محقر** / mohaqqar/: [عربی] صفت. ١. کەموکورت؛ فەقیرانە ‹اثاث محقر: کەلوپەلی کەموکورت› ٢. ناقابل؛ کەمبایەخ.

**محقق** [1] / mohaqqaq/: [عربی]/اسم. شێوە نووسینێکی عەرەبی کە زووتر لە خۆشنووسیدا بە کار دەهات.

**محقق** [2]: صفت. ١. ڕاست؛ ڕاس؛ بێدرۆ ‹آن خبر محقق است: ئەو هەواڵە ڕاستە› ٢. مسۆگەر؛ چەسپاو؛ ڕێکهاتوو ‹ریاست ایشان محقق شده است: سەرۆکایەتیان مسوگەر بووە›.

**محقق** / mohaqqeq ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. توێژەر؛ لێکۆڵەر؛ قەکۆلەر؛ کۆڵەرەوە؛ تۆژەر؛ هێرەکار: ١. خوێندەواری زانستگا کە لە گرۆیەکی لێکۆڵینەوە یان فێرکاریدا خەریکی تۆژینەوەی زانستیە ٢. ئەوی کاری لێکۆڵینەوەیە.

**محققاً** / mohaqqaqan/: [عربی] صفت. بێ شک؛ بە دروستی ‹محققاً موفق خواهی‌شد: بێ شک سەردەکەوی›.

**محققانه** [1] / mohaqqeqāne/: [عربی/ فارسی] صفت. لێکۆڵەرانە؛ تۆژەرانە ‹مقالەی محققانە: وتاری تۆژەرانە›.

**محققانه** [2]: قید. تۆژەرانە؛ لێکۆڵەرانە ‹محققانه بررسی کرده بودند نه بر اساس حدس و گمان: تۆژەرانە لێکیاندابووەوە نەک بە گۆترە›.

**محک** / mahak(k), mehak(k) ، ـها/: [عربی]/اسم. مەحەک: ١. تێساو؛ محەک؛ سەنگی مەحەک؛ بەردی ڕەشی سیلیسی زێر ئەزموو ٢. ئامێر یان پێوەمانی دەرخستنی چۆنیەتی یان ڕەسەنایەتی شتێک.

◘ **محک زدن**: ١. لە مەحەک دان؛ ساوین بە سەر بەردی مەحەکدا ٢. هەڵسەنگاندن و تاقیکردنەوەی چۆنیەتی یان ڕەسەنایەتی شتێک.

**محکم** [1] / mohkam/: [عربی] صفت. پتەو؛ بتەو؛ بتاو: ١. قایم؛ ڕێختە؛ ڕەختە؛ بەردەوام؛ سروڕ؛ خۆگرتە ‹کفش محکم: کەوشی قایم› ٢. توند؛ تون؛ تن؛ بەقووەت؛ سفت؛ ڕپ؛ پەیت؛ قەرت؛ دمرەکانی ‹سیلی محکم: زللەی توند› ٣. پلپ؛ بنەجێ؛ ڕێختە؛ ڕەختە؛ قایم؛ گورخ؛ گیردیان؛ ڕاوەستاو؛ خۆگرتوو ‹ساختمان محکم: ماڵی پتەو›.

**محکم** [2]: قید. [گفتاری] بە توندی؛ بە سەختی؛ جزم؛ سفت؛ سەخت ‹محکم خورد بە دیوار: بە توندی دای بە دیوارەکەدا›.

**محکم‌کاری** / mohkamkārî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ١. قایمکاری؛ پتەوکاری؛ کار و ڕەوتی قایم و پتەوکردنی شتێک لە سەر جێی خۆی بە چەشنێک کە نەجووڵێتەوە یان خەوشی تێ نەکەوێ ٢. [معماری] سفتکاری ٣. [مجازی] قایمکاری؛ قایمەکاری؛ مشوور و تەگبیری زۆر بۆ سەرکەوتن لە کارێکدا.

**محکمه** / mahkame ، ـها؛ محاکم/: [عربی]/اسم. [قدیمی] مەحکەمە: ١. دادگە؛ دادگا؛ دیوەخانی قازی ٢. مەتەب؛ عەیان؛ ژووری کە بژیشک نەخۆشی تێدا دەبینێ.

**محکمه‌پسند** / mahkamepasand/: [عربی/ فارسی] صفت. مەحکەمەپەسند؛ شیاوی نواندن بە دادگا ‹دلیل محکمه‌پسند: بەڵگەی مەحکەمەپەسەند›.

**محکمی** / mohkamî/: [عربی]/اسم. پتەوی؛ پەیتی؛ ڕاوەستاوی؛ قایمی؛ گورێخی؛ گورخی؛ دۆخ یان چۆنیەتی پتەو بوون.

**محکوم** [1] / mahkûm ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. مەحکووم؛ ئەوەی لە دادگا بە تاوانبار دەرچووە.

**محکوم** [2]: صفت. مەحکووم: ١. داماو لە سەلماندنی ڕاستی قسە و خوازی خۆدا ‹او در دادگاه محکوم شد: لە دادگادا مەحکووم بوو› ٢. ناچار بە قەبووڵکردنی دۆخێکی ناخۆش و نالەبار ‹محکوم به تنهایی: مەحکووم بە تەنیایی›.

هەروەها: **محکوم بودن؛ محکوم شدن؛ محکوم کردن**

**محکومیت** / mahkûmîyyat ، ـها/: [عربی]/اسم. مەحکوومیەت؛ دۆخ یان چۆنیەتی مەحکووم بوون ‹نیمی از دوران محکومیت را گذراند: نیوەی مەحکوومیەتەکەی تێپەڕاند›.

**محل** / mahal(l) ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. جێگا؛ جێ؛ جیە؛ شوێن؛ شۆنی؛ شۆن؛ ئەخەکن؛ گورەنگە؛ یاگێ ‹محل نگهداری: شوێنی هەلگرتن› ۲. *[گفتاری]* گەڕەک؛ تاخ؛ کورنگ.

◙ **محل تقاطع** ☜ **تقاطع-۲**

◙ **محل داشتن:** جێ هەبوون: ۱. جێگە بوون ۲. بڕ هەبوون؛ بڕدار بوون.

**محل نگذاشتن:** هەواڵ لێ نەپرسین؛ سەرنج پێ نەدان؛ ئاوڕ لێ نەدانەوە.

**محلات** / mahallāt/: [عربی] جمعِ ☜ **محلّه**

**محلل** / mohallel ، ـها/: [عربی]/اسم. جاش؛ پیاوێ کە کرێ دەستێنێ ژنی سێ‌تەلاقە بە وادە مارە بکا و تەلاقی بداتەوە تا دیسان لە شووەکەی مارە بکرێتەوە.

**محلول**[1] / mahlûl ، ـها/: [عربی]/اسم. *[شیمی]* گیراوە؛ شلاوک؛ تراوێ کە ماکێکی تێدا تواوەتەوە.

◙ **محلول اشباع شده:** گیراوەیێ کە زۆرترین ڕادەی ماکی تێدا تواوەتەوە، بەبێ ئەوەی بنیشێ یان سەرکەوێ.

**محلول جامد:** تێکەڵاوی خۆگر و یەکدەست لە دوو یان چەن ماک (وەک ئالیاژ).

**محلول**[2]: *صفت.* تواوە؛ تواو؛ ئەوەتاویا ‹مقداری نمک در این آب محلول است: هێندێک خوێ لەم ئاوەدا تواوەتەوە›.

**محله** / mahalle ، ـها؛ محلات/: [عربی]/اسم. گەڕەک؛ تاخ؛ کورنگ؛ مەحەللە؛ مەهلا.

**محلی** / mahallî/: [عربی] *صفت.* مەحەلی؛ خۆماڵی: ۱. ناوچەیی؛ ناوخۆیی؛ زاگەبەری ‹غالب مدیران، محلی نیستند!: زۆربەی بەڕێوەبەران، خوماڵی نین!› ۲. باو لە شوێنێک ‹لباس محلی: جلکی خوماڵی›.

**محمدی** / mohammadî/: [عربی] *صفت.* موحەممەدی: ۱. سەر بە حەزرەتی موحەممەد (س)، پێغەمبەری ئیسلام ۲. ئیسلامی؛ سەر بە ئیسلام ۳. موسڵمان؛ شۆنەڕای ئیسلام.

**محمل** / mahmel ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. بۆنە؛ هۆ ‹داشت برای کارش محمل می‌تراشید: خەریک بوو بونەی بۆ کارەکەی دەتاشی› ۲. *[قدیمی]* کەژاوە؛ کەجاوە؛ هۆدەئاسای سەر پشتی وشتر.

**محمول** / mahmûl ، ـها/: [عربی]/اسم. *[منطق]* گوزارە؛ چەمک؛ خەبەر؛ ڕەستەیەکی هەواڵی، ڕاست یان درۆ.

**محمولات** / mahmûlāt/: [عربی] جمعِ ☜ **محموله**

**محموله** / mahmûle ، ـها؛ محمولات/: [عربی]/اسم. بار؛ کاڵایێ کە لە ناو بەستەدا، لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر دەبرێت ‹محموله‌ی کامیون تیرآهن بود: باری کامیۆنەکە تیراسن بوو›.

**محن** / mehan/: [عربی] جمعِ ☜ **مِحنَت**

**محنت** / mehnat ، ـها؛ محن/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کوڵ؛ مەینەت؛ چەرمەسەرێ؛ تاڵی؛ ڕیپ؛ خەم؛ خەفەت؛ گژم؛ جخار؛ جەخار؛ ڕاخ؛ سەختی و دژواری ژیان.

**محنت بار** / mehnatbār/: [عربی/ فارسی] *صفت.* مەینەتبار؛ خەفەتهێنەر؛ هۆی سەرهەڵدانی کوڵ و مەینەت ‹دوران محنت‌بار: سەردەمی مەینەتبار›.

**محنت کش** / mehnatkeš ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* مەینەتکێش؛ جەورکێش؛ تووشیاری مەینەت و چەرمەسەرە.

**محو** / mahv/: [عربی] *صفت.* تەرت؛ مەحف: ۱. لەناوچوو؛ فەنابوو؛ تیاچوو ۲. *[مجازی]* لێڵ؛ نادیار ‹تصویر محو: وێنەی لیل›.

◘ **محو بودن**: لێڵ بوون؛ بە تەواوی ڕوون نەبوون؛ بە تەواوی ئاشکرا نەبوون؛ جوان دیار نەبوون ‹تصویرش محو بود: وێنەکەی لیل بوو›.
**محو شدن**: شوێنەوار نەمان: ۱. تەرت بوون؛ تەرت و تونا بوون؛ لە بەین چوون؛ نابوود بوون؛ فەنا بوون؛ لە ناو چوون ‹آن آثار بە کلّی محو شد: ئەو ئاسەوارە لە بنەڕەتەوە شوێنەواریان نەما› ۲. بزر بوون؛ گوم بوون. هەروەها: **محو کردن**
**محو تماشای کسی/ چیزی شدن**: تاس بردنەوە؛ ماقی کەس/ شتێک بوون؛ چاو تێبڕین ‹چنان محو تماشای دختر شده بود کە متوجە آمدنم نشد: وا ماقی کچە ببوو نەیزانی بە هاتنم›.
**محور** / mehvar ، ـها/: [عربی]/سم. تەوەرە؛ تەوەر: ۱. ڕاستەهێڵێکی وا کە تەن یا تەشکێکی هەندەسی لە دەوریدا هەڵبسووڕێت ۲. هێڵێکی ڕاست کە دەقی‌تر بە گوێرەی ئەو جێگر دەبن ۳. *[کالبدشناسی]* دووهەمین مۆرەی مل ٤. بەشی ناوەندی یان سەرەکی ‹محور بحث: تەوەرەی باس› ٥. هێڵی سەرەکی بزاو، گەشە و پەرە ساندن ٦. هێڵی نێوان دوو جەمسەری گۆ ‹زمین بە گرد محور خود می‌چرخد: زەوین لە دەوری تەوەرەی خۆیدا هەڵدەسووڕێ›.
**محوری** / mehvarî/: [عربی] صفت. ۱. تەوەری؛ تەوەرەیی ‹حرکت محوری: بزاڤی تەوەری› ۲. سەرەکی؛ بنەڕەتی؛ بناغەیی ‹موضوعات محوری: بابەتە سەرەکیەکان›.
**محوطە** / mohavvate ، ـها/: [عربی]/سم. گۆڕەپان؛ حەسار؛ هنگ؛ ناوان؛ دنگال؛ پانایییەکی تایبەت لە چاو دەوروبەری ‹محوّطەی ورزشی: گۆڕەپانی وەرزشی›.
**محول** / mohavval/: [عربی] صفت. ۱. ڕاسپێراو؛ سپێردراو؛ ئەسپاردراو؛ سپێریاگ ‹امور محول بەخوبی اجرا شد: کار و باری ڕاسپێراو بە جوانی بەڕێوە چوو› ۲. خراو؛ خریاگ ‹کار شما بە ماه آیندە محول شده است: کارەکەتان خراوەتە مانگی داهاتوو›. هەروەها: **محول کردن؛ محول شدن**
**محیرالعقول** / mohayyerol'uqûl, -'oqûl/: [عربی] صفت. هەژەنەد؛ سەرسووڕێنەر؛ سەرسووڕێن؛ سەیر و سەمەرە.
**محیط**[1] / mohît ، ـها/: [عربی]/سم. ئاقار؛ هەڤیرکە؛ دەور؛ دەوروبەر؛ دۆراندۆر؛ دۆر؛ دەور؛ دۆرمادار؛ دۆرمادۆر؛ دەوران‌پشت؛ بۆردۆر؛ گڕ؛ هەڤیرکە؛ ئالی؛ گردوپەڕ؛ دۆن؛ هاوێر؛ هاوێردۆر؛ هاوێدۆر: ۱. ئەو بار و دۆخ و شتانەی کە کەس یان شتێک دادەگرن ‹محیط اجتماع: ئاقاری کۆمەڵگا› ۲. ژینگە؛ وار ‹آلودگی محیط: پیسی ئاقار› ۳. شوێن؛ دەڤەر؛ ئەو بۆنە و داب‌ونەریتانەی (فەرهەنگی و کۆمەڵایەتی) کە لە ژیانی مرۆدا ڕەنگ دەدەنەوە ‹تأثیر محیط: کاریگەری دەوروبەر› ٤. پەڕانپەڕ؛ کەمە؛ کەمەرە؛ چەنبەر؛ سنووری تەشکێکی هەندەسی تەخت ‹محیط دایرە: پەڕانپەڕی جەغز›.
◘ **محیط زیست**: ژینگە؛ ئاقاری ژین؛ کۆمەڵە هۆکاری فیزیکی، کیمیایی و ژیناسی (وەک ئاو و هەوا، خاک و گیانداران) کە کار دەکەنە سەر ژین و داهاتووی گیانداران و کۆمەڵگاکانیان.
**محیط**[2]: *صفت*. ۱. سوار؛ زاڵ؛ شارەزا ‹او بر همەی آن موضوعها محیط بود: (ئەو) بە سەر هەموو ئەو بابەتانەدا زاڵ بوو› ۲. دەورگر؛ داپۆشەر ‹دایرەی محیط بر مربع: جەغزی دەورگری چوارگۆشە›.
◘ **محیط شدن**: ۱. زاڵ بوون؛ سوار بوون؛ شارەزایی پەیدا کردن ۲. لا لێ‌بڕین؛ لا لێ‌سەندن.
**محیطبان** / mohîtbān ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /سم. ژینگەوان؛ چاودێری ژینگە.
**محیط‌شناس** / mohîtšenās/: [عربی/ فارسی] ☜ **بوم‌شناس**

**محیط شناسی** / mohîtšenāsî/: [عربی/ فارسی]
☜ **بوم‌شناسی**

**محیط گرایی** / mohîtgerāyî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ئامۆژەییێ که پێی وایه ئاقار پتر له ژنیتیک له سەر گەشەی هزری و فەرهەنگی مرۆڤ کاریگەره: **اصالت محیط**

**محیطی** / mohîtî/: [عربی] *صفت.* ئاقاری؛ سەر به ئاقار ‹شرایط محیطی: هەلومەرجی ئاقاری›.

**محیل** / mohîl/: [عربی] *صفت.* فێڵباز؛ دۆده؛ جامباز؛ دەسبڕ؛ گزیکار.

**محیلانه** / mohîlāne/: [عربی/ فارسی] *قید.* فێڵبازانه؛ جامبازانه؛ دەسبڕانه؛ گزیکارانه.

**مخ**[1] / mox ، ـها/: [عربی] *اسم.* مۆخ؛ موخ؛ پلپ؛ مێشرەف: ۱. گەورەترین بەشی مێشک که له دوو نیوەگۆی ڕاست و چەپ پێکهاتووه ۲. *[مجازی، گفتاری]* مەغز؛ مەژک؛ مەژگ؛ مژگ؛ میژگ؛ مەزک؛ مێشک؛ مژی ۳. *[مجازی، گفتاری]* بیر؛ ویر؛ هۆش ٤. *[مجازی، گفتاری]* کەلله؛ کەللێ؛ سەر.

▣ **مخ کسی تکان خوردن:** *[مجازی]* مێشکی کەسێک شڵەقیان؛ مێشکی کەسێک داتەکین؛ مەژگوو یۆی شڵێویەی؛ مەژووی کەسێ چەلقیان؛ عەقڵ له دەست دانی کەسێک؛ تێکچوونی کەسێک ‹عیب ندارد، ولش کن، مخ این بیچاره تکان خورده!: قەیدێ ناکا، لێی گەڕه، ئەم بەستەزمانه مێشکی شڵەقاوه!›.

**مخ کسی خوب کار کردن:** *[مجازی]* مێشکی کەسێک باش کارکردن؛ باش بەهره له بیر و هۆش گرتن ‹مخ تو خوب کار می‌کند، اما نمی‌دانم چرا به جایی نمی‌رسی!: مێشکت باش کار دەکا، بەلام نازانم بۆ به هیچ کوێ ناگەی!›.

**مخ کسی داغ شدن:** *[مجازی]* چاوی کەسێک پەڕینه تەوقی سەری؛ به هۆی تووڕەیی زۆرەوه هەڵچوون ‹تا این خبر را شنیدم مُخم داغ شد: هەر ئەم هەواڵەم پێ‌گەیشت چاوم پەڕیه تەوقی سەرم›.

**مخ کسی را خوردن:** *[مجازی]* مێشکی سەری کەسێ بردن؛ ئەلفەلەیله بۆ کەسێ خوێندن؛ مەغزی کەسێک داتەکاندن؛ هیلاک کردنی کەسێک به هۆی زۆربێژییەوه ‹یک ساعت تمام مخ همه را خورد: ساعەتێکی تەخت مێشکی سەری بردین›.

**مخ کسی سوت کشیدن:** *[مجازی]* چاوی کەسێک مۆڵەق دان؛ سەری کەسێک سووڕمان ‹وقتی قیمت خانه را گفتند، مُخم سوت کشید: کاتێ بایی ماڵەکەیان گوت، چاوم مۆڵەقی دا›.

**مخ کسی عیب داشتن:** *[مجازی]* عەقڵی کەسێک سێسووچ بوون؛ مەژگوو یۆی پووت بیەی؛ مێشک لای کەسێک نەبوون؛ له ئاوەز بێ‌بەهره بوون. هەروەها: **مخ کسی عیب کردن**

**از مخ معاف/ خلاص/ راحت بودن:** *[مجازی]* مێشک قرپات بوون؛ بێ‌عەقڵ بوون ‹این بیچاره از مخ معاف است: ئەم بەستەزمانه مێشکی قرپاته›.

**مخ**[2]: *صفت.* *[مجازی، گفتاری]* وریا؛ مەغز؛ زۆر زیت و زانا و بیرمەند ‹آرام خیلی مُخ است: ئارام یەکجار وریایه›.

**مخابرات** / moxāberāt/: [عربی] *اسم.* ۱. کار و ڕەوتی ناردن و وەرگرتنی هەواڵ به یارمەتی ئامێری ئەلکترۆمیگناتیسی (وەک تەلەگراف، تەلەفون، ڕادیۆ، ساتەلایت و...) ۲. دام و دەزگا و ڕێخراوەی بەرپرسی ئەم کاره.

**مخابره** / moxbere/: [عربی] *اسم.* کار و ڕەوتی ناردن یان وەرگرتنی هەواڵ، بەتایبەت به ئامێری میگناتیسی. هەروەها: **مخابره شدن؛ مخابره کردن**

**مخارج** / maxārec/: [عربی] *اسم.* خەرج؛ مەزاخت؛ مزەخت؛ مەزێخ؛ مەزیخ؛ مەزاخ؛ مەزخ: ۱. مەسرەف ‹از عهدەی مخارج برنمی‌آییم: دەرەقەتی خەرج نایین› ۲. ئەوەی خەرج بووه

‹لیست همەی مخارج را بنویس!: لیستی هەموو مەزاختەکان بنووسە!› ۳. *[زبان‌شناسی]* ئەو بەشانە لە دەم و زار و گەروو کە پیتی تێدا بەدی‌دێ و دەردەکەوێ ٤. جمعِ ☜ **مَخرَج**

**مخازن** / maxāzen/: [عربی] جمعِ ☜ **مَخزَن**

**مخاصمات** / moxāsemāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مُخاصمه**

**مخاصمه** / moxāseme ، ـها؛ مخاصمات/: [عربی] *اسم.* دژمناتی؛ دوژمنایەتی؛ دژبەرایەتی؛ دژمنی کردن وێڕای شەڕ و پێک‌هەڵپڕژان.

**مخاط** / moxāt/: [عربی] *اسم. [زیست‌شناسی]* کاژی پڕ لە لووی ئەو شوێنانەی لەش کە پێستیان نیە، بەتایبەت ئەو کاژانەی کە لە ناوەوە هەناو دادەپۆشن.

**مخاطب** / moxātab ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* ۱. گوێگر؛ بیسەر؛ ئەو کەسەی ڕووی قسەت لەوە ۲. *[دستور]* دووهەم کەس.

**مخاطرات** / moxāterāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مخاطره**

**مخاطره** / moxātere/: [عربی] *اسم.* مەترسی: ۱. ڕەوتی خەتەرکردن؛ خۆ خستنە ناو خەتەرەوە ‹سعی کرد از مخاطره بپرهیزد: هەوڵی دا خۆ لە مەترسی بپارێزێ› ۲. ـها؛ مخاطرات/ خەتەر؛ بقە ‹نمی‌خواست جانش به مخاطره بیافتد: نەیدەویست گیانی بکەوێتە مەترسیەوە›.

**مخالف** / moxālef/: [عربی] *صفت.* ۱. پێچەوانە؛ بەرچەپ ‹جهت مخالف: لای پێچەوانە› ۲. بەرهەڵست؛ پێچەوانە؛ دژ؛ نەیار ‹رفتار مخالف: کردەوەی بەرهەڵست› ۳. ـها؛ ـان؛ ـین/ نەیار؛ بەرهەڵست؛ نەرێن؛ بەرهەڵستکار؛ نەساز لەگەڵ پارت، بنکە یان بار و دۆخێکدا ‹حزب مخالف: پارتی نەیار›.

**مخالفت** / moxālefat ، ـها/: [عربی] *اسم.* نەیاری؛ دژایەتی؛ نەسازی؛ قرخەمەرەزێ؛ ناڕێکی؛ بەرهەڵستی؛ سەرپێچکاری.

▣ **مخالفت کردن:** بەرهەڵست بوون؛ دژایەتی کردن؛ بەرهەڵستی‌کردن؛ دەربڕینی نەسازی و نەیاری خۆ ‹با کار شما مخالفت کردند: بەرهەڵستی کارەکەتان بوون›. هەروەها: **مخالفت شدن**

**مخالفت آمیز** / moxālefatāmîz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* نەیارانە؛ بەرهەڵستانە ‹سخن مخالفت‌آمیز: قسەی نەیارانە›.

**مخالف‌خوانی** / moxālefxānî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم. [مجازی]* کار و ڕەوتی گوتن یان نووسینی قسەی نەیارانە.

**مخبر** / moxber ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* هەواڵدەر؛ هەواڵبێژ.

**مخبط** / moxabbat/: [عربی] *صفت.* تێکچوو؛ بیرشاش؛ بیرئاڵۆز.

**مختار** / moxtār/: [عربی] *صفت.* سەربەست؛ خاوەن ئیختیار ‹هر کس مختار است برای زندگی و آینده‌ی خود تصمیم بگیرید: هەموو کەسێک لە سەر بڕیاردان بۆ ژیان و داهاتووی خۆی سەربەستە›.

**مخترع** / moxtare' ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* داهێنەر؛ وەدی‌هێن؛ ئەو کەسەی ئامێر یان ڕێکارێکی نوێ دادێنێ.

**مختص** / moxtas(s)/: [عربی] *صفت.* تایبەت ‹این نوع چیز نوشتن مختص اوست: ئەم جۆرە شت نووسینە تایبەت بەوە›.

**مختصات** / moxtassāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مختصّه**

**مختصر** / moxtasar/: [عربی] *صفت.* ۱. کورتە؛ کورت؛ پوختە؛ کورت‌کراو؛ سەر و پڕت؛ کۆتاکراو ‹مختصر واقعه این بود: گێڕانەوەی کورتەی ڕووداوەکە ئەمە بوو› ۲. کەم؛ هندک ‹درآمد مختصر: داهاتی کەم›.

**مختصراً** / moxtasaran/: [عربی] *قید.* بەکورتی ‹واقعه را مختصراً تعریف کنید!: ڕووداوەکە بەکورتی بگێڕنەوە!›.

**مختصه** / moxtasse ، ـها؛ مختصات/: [عربی]/اسم. ١. دانسته؛ تایبەتمەندی ٢. نیشانە؛ هەر یەکە لەو ژمارە و پیتانە کە بۆ دیاری‌کردنی شوێنی خاڵێک لە سەر خەت، ڕووپەڕ یان جێگایەک بە کار دێن.

**مختـل** / moxtal(l)/: [عربی] صفت. تێکچوو؛ ئاڵۆز؛ شڵەژاو؛ شێوا؛ شێویا؛ لاسەنگ ‹مختل شدن کارها: تێکچوونی کاروبار›.

**مختلس** / moxtales ، ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. گەندەڵ‌کار؛ ئەوەی کە خەریکی دزی و گزییە، بەتایبەت لە دارایی دەوڵەت یان شیرکەتێک.

**مختلط** / moxtalet/: [عربی] صفت. تێکەلاو؛ تێکەڵ ‹کلاس مختلط یعنی کلاسی کە هم شامل دختر و هم پسر است: کلاسی تێکەلاو یانێ کلاسێ کە هەم کچی تێدایە و هەم کوڕ›.

**مختلف** / moxtalef/: [عربی] صفت. جۆراوجۆر؛ جۆربەجۆر؛ جۆرواجۆر؛ جووراوجوور ‹کارهای مختلف: کاری جۆراوجۆر›.

**مختومه**/ maxtûme/: [عربی] صفت. بڕاوەوە؛ دوایی‌هاتوو؛ تەواوبووگ؛ کۆتایی پێ‌هاتوو.

**مخچه** / moxče/: [عربی/ فارسی]/اسم. موخچە؛ بەشێک لە مێشکە لە پشتەسەر و ژێر موخدا و کارە سەرەکیەکەی بریتی لە بەڕێوە بردنی جوولەی ویستەکی و هاوسەنگی و خۆگری لەشە.

**مخدر** / moxadder ، ـها/: [عربی] صفت. سڕکەر ‹تریاک مخدر است: تریاک سڕکەرە›.

**مخدرات** / moxaddarāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مخدره**

**مخدرات** / moxadderāt/: [عربی] ☜ مواد مخدر، **مواد**

**مخدره** / moxaddare ، ـها؛ مخدرات/: [عربی]/اسم. *[نامتداول]* خات؛ خادێ؛ خاتوون؛ خان.

**مخدوش**/ maxdûš/: [عربی] صفت. دەستلێدراو؛ دەست تێ‌بڕاو. هەروەها: **مخدوش بودن؛ مخدوش شدن؛ مخدوش کردن**

**مخدوم**/ maxdûm/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ئەرباب؛ ئاغا؛ ئەرواو؛ خاوەن‌کار.

**مخـده** / moxadde, mexadde ، ـها/:/اسم. ١. مەخەدە؛ پشتی‌ئاسایەک بۆ لە سەر دانیشتن و پاڵ پێوەدان ٢. پشتی.

**مخرب** / moxarreb/: [عربی] صفت. وێرانکەر؛ خاپوورکەر؛ ڕووخێنەر؛ ماڵ‌وێرانکەرە ‹زلزلەی مخرب: بوومەلەرزەی وێرانکەر›.

**مخرج** / maxrac ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. دەرگا؛ درگا؛ دریا؛ کون یان دەلاقەی چوونە دەر ٢. *[مجازی]* کووم؛ کۆم؛ پند؛ پندرۆ؛ سوو؛ خڕک؛ قولتەفسە؛ قیت؛ کونی قوون؛ کونی دوایی کۆئەندامی هەرسەکی گیانداران کە پیسی لێوە دەردەچێ ٣. *[ریاضی]* ژمارەی لە ژێر هێڵی کەسری (وەک ٥ لە ٢/٥ دا) ٤. /مخارج/ شوێنی دروست بوون و دەرهاتنی پیتی ئەلفوبێ لە دەم و زارەوە.

**مخـروب** / maxrûb/: [عربی] صفت. خاپوور؛ وێران؛ دێران؛ کاول؛ دێرس؛ ڕووخاو؛ دارماو؛ ڕماو؛ کاولە؛ تەپاو؛ داتەپاو ‹خانەی مخروب: ماڵی کاول›: **مخروبه**

**مخروبه** / maxrûbe/: [عربی] ☜ **مخروب**

**مخروط** / maxrût ، ـها/: [عربی]/اسم. *[هندسه]* قووچ؛ قووچەک؛ قووچک؛ قووتەک؛ جۆرێک تەشکی هەندەسی وەک کەلەقند کە لە هەڵسوورانی سێگۆشێکی ڕاستگۆشە بە دەوری پەلێکیدا بەدی‌دێ.

◘ **مخروط** آتشفشان: قووچکەی گڕکانێ؛ قووچکەی گڕکان؛ قووچەکی سەر گڕکان کە لە سارد بوونەوەی گڕماکی هەڵپڕژاوی گڕکان بەدی‌دێت.

**مخروطات** / maxrûtāt/: [عربی]/اسم. لقێک لە زانستی هەندسە کە دەپەرژێتە سەر قووچەک و بڕگەکانی لەگەڵ ڕووپەڕدا.

**مخروطـــی** / maxrûtî ، ـهـا/: [عربـی] *صـفت*. قویچک؛ قـووچ؛ قـووچی؛ قووچـەکی؛ هـوللکن؛ کەلەقەندی.

**مخزن** / maxzan ، ـها/: [عربی]/*اسم*. کۆگە؛ کۆگا؛ هـەمار؛ کۆمگـە: ۱. /مخـازن/ بارخانـە؛ جێگـای پاشەکەوتکردن یان هەڵگرتنی شتێک ‹مخـزن نفت: هـەماری نـەوت› ۲. شـوێنێک کـە شـتێک هەڵدەگرێ یان پاشەکەوت دەکا ‹ مخـزن اسـرار: کوگای نهێنی›.

**مخصـوص** / maxsûs/: [عربـی] *صـفت*. تایبـەت؛ تەیبە؛ تایبەتی؛ تاویەتی؛ تـایوەتی: ۱. سـەر بـە کەس، شت یـان کـارێکی تایبـەت ‹ایـن شـوخی مخصوص او بود: ئەم گاڵتەیە تایبەتی ئەو بوو› ۲. بە دانسـتە یـان تایبەتمەندیـەکی دیـاریکراو و بـێوێنـەوە ‹صـدای مخصوصی داشـت: دەنگێکـی تایبەتی هەبوو› ۳. خاوەنی جۆرێـک سـەرتری و سەرپشـکی ‹بسـتنی مخصـوص، کبـاب مخصـوص: بەستەنی تایبەت، کەبابی تایبەتی›.

▣ **مخصوص کردن**: تایبەت دان؛ تایبەتیکـردن بە کەس یان شتێکەوە.

**مخصوصاً** / maxsûsan/: [عربی] *قیـد*. بەتایبـەت؛ بەتایبـــەتی؛ گەوشـــینی؛ خازمـــا؛ خاسمـــا: ۱. نەخوازە؛ نەخوازا؛ نەخوازەڵا؛ نمـازە؛ نـەخازا؛ ناوازە؛ نەوازە ‹مخصوصا تو باید خیلی هوشـیار باشـی: بەتایبەت تۆ دەبێ زۆر وریـا بی› ۲. دەسـانقەس؛ بەئەنقەست؛ بە دانستە؛ لەبەر هۆ یان هۆکارێکی تایبەت ‹مخصوصا این را گفـتم: دەسـانقەس ئەمـەم وت›.

**مخطط** / moxattat/: [عربی] *صفت*. کـێڵـکـێڵ؛ کێڕـکێڕ؛ کێڵدار؛ هێڵدار؛ خەتدار؛ خەتـخەتی.

**مخفف** / moxaffaf/: [عربـی] *صـفت*. سووکەڵـە؛ کورتـە؛ کـورتکـراوە ‹«ار» مخفـف «اگـر» اسـت: «گەر» سووکەڵەی «ئەگەر»›.

**مخفی** / maxfî/: [عربی] صفت. شاراوە؛ شاردراوە؛ شـــاریاوە؛ شـــاریاگەوە؛ پێـــوارە؛ پەنامـــەکی؛ پەنامەگی؛ پەکوور؛ نهێنی؛ ئەوەشـاریاگ؛ نادیـار ‹راه مخفی: ڕێگای شاراوە›.

▣ **مخفی شدن**: خۆ شاردنەوە؛ خـۆ قـایمکـردن؛ وێ سەختکەردەی؛ وێ شارتەیوە؛ خـۆ پـەنا دان؛ پەنامگێرتەی؛ خـۆ دزینـەوە ‹رفت تـوی زیـرزمین مخفـی شـد: چـوو لـە ژێرزەویـدا خـۆی شاردەوە›. هەروەها: **مخفی بودن؛ مخفی کردن**

**مخفیانـــه** / maxfiyāne/: [عربـی/ فارسـی] *قیـد*. بەدزییەوە؛ بێ دزیەو؛ وە دزیکـەوە؛ بـە نهـێنی؛ پەنامەکی؛ لە ژێرەوە ‹مخفیانـە بـە او پـول مـیداد: بەدزییەوە پارەی پێدەدا›.

**مخفیگاه** / maxfîgāh ، ـها/: [عربی/ فارسـی]/*اسم*. حەشارگە؛ شاردنگە؛ وەشارگە: ۱. شوێنی شـت شاردنەوە ۲. بنەگە؛ حەشـار؛ پـەنامگا؛ ڕەبـەت؛ شوێنی خۆ شاردنەوە ‹شـب از مخفیگـاهش بیـرون میآمد: شەو لە حەشارگەکەیەوە ئەهاتە دەر›.

**مخـــل** / moxel(l)/: [عربـی] *صـفت*. تێکـدەر؛ گێرەشێوێن؛ بشێونە؛ شێوەژنە.

**مخلص** / maxlas/: [عربی] *صفت*.*[گفتاری]* کورتە؛ پوختە؛ کورتکراوە؛ سەر و پرت؛ سـەر و پـۆرت ‹مخلص کلام اینکه...: پوختەی قسە ئەمەیە کە...›.

**مخلـص** / moxles/: [عربـی] *صـفت*. ۱. بـێڕیـا؛ بێخەوش ۲. دڵسـۆز؛ بـە دۆسـتایەتی دوور لـە ڕیا.

**مخلصـانه** / moxlesāne/: [عربـی/ فارسـی] *قیـد*. دڵپاکانە؛ بێگرێ و گۆڵ؛ بە پاکی؛ بەبێ ڕیا.

**مخلصه** / moxallase/: [عربی] ☜ **عاقرقَرحا**

**مخلفات** / moxallafāt/: [عربی]/*اسم*. ۱. چەشـە؛ ئەوەی لەگەڵ چێشتدا دەیخۆن ۲. ئەو شتانەی لەگەڵ مـاکی سـەرەکی دەیکەنـە نێـو چێشـت (وەک نـــۆک و پیـــواز و... لـــەناو ئاوگۆشـــتدا) ۳.*[گفتاری]* کەلوپەلی لاتەکی ئامێرێک.

**مخلوط**[1] / maxlût ، ـها/: [عربی]/*اسم*. ۱.*[شـیمی]* ئاوێتە؛ ئامێتە؛ تێکەڵ؛ بـەرهـەمی چـەن مـاکی تێکەڵکراو کە بە شێوەی میکانیکی لێک جـودا

دەبنــەوە ٢. مــەخلووت؛ فالوودەبەســتەنی؛ تێکەلاوی پالووده و بەستەنی.

**مخلوط**[٢]: *صفت.* ئاوێتە؛ ئامێتە؛ تێکەڵ؛ دیەک.

**مخلوط کن** / maxlûtkon ، ـها/: [عربی/ فارسی] /*اسم.* ئامێرێکی میکانیکی، دەستی یان کارەبایی، بۆ تێکەڵکردنی دوو یا چەن شت (زۆرتر خواردەمەنی).

**مخلوع** / 'maxlû/: [عربی] *صفت.* دەرکراو؛ لادراو؛ لابراو؛ لانراو ‹شاه مخلوع: شای دەرکراو›.

**مخلوق** / maxlûq/: [عربی] *صفت.* خولقاو؛ داهاتوو؛ چێبوو؛ دروستکراو؛ ئافراندی؛ داهێنراو.

**مخلوقات** / maxlûqāt/: [عربی]/*اسم. [گفتاری]* ١. خەڵک؛ مەردم؛ عالەم ‹می‌خواهی همه‌ی مخلوقات را بریزی اینجا؟: دەتەوێ هەموو خەڵکمان لێ کۆ کەیتەوە؟› ٢. بوونەوەران.

**مخمر** / moxammer ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ترشێنەر؛ هۆکاری هەڵهێنان و تورشاندن (وەک باکتری، کارگ یان ئانزیم).

**مخمس** / moxammas ، ـها/: [عربی]/*اسم.* پێنجخشتەکی؛ بەندە شیعرێکی پێنج لەتی.

**مخمصه** / maxmase ، ـها/: [عربی]/*اسم.* گێچەڵ؛ گێچەڵە؛ تەنگژە؛ بار و دۆخی ناخۆش و گیر و گرفت لە کار و ژیانی ڕۆژانەدا.

**مخمل** / maxmal/: [عربی]/*اسم.* فرەز؛ مخمـوور؛ مەخمەڵ؛ مەخمەر؛ مەخموور؛ قەدیفە؛ قوماشی یەکلا کورکن لە ئاورێشمی ئاسایی یان دەسکرد.

**مخملک** / maxmalak/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* میکوتک؛ مێکوتک؛ میرکوت؛ مێکوتە؛ نیرگوتک؛ نەخۆشیەکی چلکی کە لە جۆرێک باکتریوە سەر هەڵدەدا و زۆرتر منداڵان تووش دەبن، سەرەتا گەرووی نەخۆش چلک دەکا و دواییش تای لێ دێ و زیپکە دەردەدا.

**مخملی** / maxmalî/: [عربی] *صفت.* مەخمەلی؛ مەخمەلین: ١. لە جنسی مەخمەڵ ‹قبای مخملی: کەوای مەخمەلی› ٢. نەرم و ناسک وەک مەخمەڵ ‹صدای مخملی: دەنگی مەخمەلی› ❋ مخملین

**مخملین**/ maxmalîn/: [عربی] ☜ مخملی

**مخمور** maxmûr/: [عربی] *صفت. [ادبی]* کاس؛ گێژ؛ وڕ؛ خەواڵوو، بەتایبەت بە هۆی شوێنەوای خواردنەوەی ئەلکولی یان ماکی سڕکەرەوە.

**مخموری** / maxmûrî/: [عربی]/*اسم.* کاسی؛ گێژی؛ وڕی.

**مخنث** / moxannas ، ـان/: [عربی]/*اسم.* مێرمەندۆک؛ نێرمەندۆک؛ نێرمووک؛ نێرەمووک؛ نێرەمۆک؛ ئێرەموک؛ نێرمۆک؛ نێرمۆ؛ نە نێر نە مێ: ١. پیاوێ کە کۆندامی زایەندی گەشەی نەکردبێ ٢. ئاغەباجی؛ باجی‌ئەولحەمی؛ پیاوێ کە ئاکاری ژنانە بێ ٣. حیزەڵە؛ هێزەکە؛ ئۆبنە؛ ئوبنەیی؛ بەپشت؛ پشتە؛ پیاوێ کە پیاوانی‌تر سواری دەبن.

**مخوف** / maxûf/: [عربی] *صفت.* ترسێنەر؛ بەترس؛ بترسێن؛ زاتبەر؛ زەندەقبەر؛ هۆڤ؛ دڵتۆقێن ‹صدای مخوف: دەنگی ترسێنەر›.

**مخیر** / moxayyar/: [عربی] *صفت.* ئازاد؛ سەربەست؛ سەرپشک.

**مخیله** / moxayyele, moxayyale/: [عربی]/*اسم.* واق؛ بیرگە؛ جێ‌هزر ‹معلوم نبود چه فکری در مُخیله‌ی او می‌گذشت: دیار نەبوو چ بیرێک بە واقیدا تێ‌دەپەڕی›.

**مد** / mad(d)/: [عربی]/*اسم.* ١. خێزاو؛ کەش؛ هەڵکش؛ ڕەوتی هەڵسان؛ هەڵکشان؛ ڕادان؛ دیاردەی بەرز بوونەوەی ڕادەی ئاوی دەریا بە هۆی هەڵکشان و داکشانی ئاو ٢. خێزاو؛ بەرزترین ڕادەی ئاوی دەریا لە ڕۆژدا بە هۆی دیاردەی هەڵکشان ٣. کەشە؛ کڵاوە؛ بزوێنی سەر «الف» لە ڕێنووسی عەرەبی و فارسیدا کە دەیکاتە «آ».

▣ **مد نظر داشتن:** لە بەر چاوگرتن؛ لە بەر چاودا بوون؛ سەرنج پێدان؛ سەرنج داپنەی.

**مد** / mod/: [فرانسوی]/اسم. باو؛ داب: ١. /ـها/ شێوازی تەرپۆشی و خۆ رازاندنەوە ‹مُد لباس: باوی جلوبەرگ› ٢. داکەفتی؛ سەلیقەی کۆمەڵگا ‹مدتی سفر اُروپا مُد بود، حالا رفتن به سوریه و ترکیه مُد شده است!: ماوەیەک سەفەر بۆ ئوروو‌پا باو بوو، ئێستا چوونە سووریە و تورکیە باوە!› ٣. نیڤار؛ شتومەکی برەودار و بەرەواج ‹حالا این کیفها مد است: ئێستە ئەم کیفانە باوە›.

**مداح** / maddāh ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. ١. پەسندەر؛ پێهەڵبێژ؛ کەس یان دەزگایەک کە پەسن دەدا ‹روزنامەهای مداح: رۆژنامەگەلی پەسندەر› ٢. دولگەهۆن؛ دولگەبێژ؛ دەنگ‌بێژی شیعری مەزهەبی، بەتایبەت لە پەسندانی بنەماڵەی پێغەمبەردا.

**مداحی** / maddāhî/: [عربی]/اسم. ١. پەسندەری؛ پێهەڵبێژی؛ پیداهەڵبێژی؛ پیاهەڵخوێنی؛ کار و پیشەی کەسێ کە پارە وەردەگرێ و پەسن دەدا ٢. /ـها/ کاری پێدا هەڵگوتن.

**مداخل** / madāxel/: [عربی]/اسم. داهات؛ بەتایبەت داهاتی لاتەکی (وەک شاگردانە، دەسخۆشانە، لاشیرینی و رشفەت).

**مداخلات** / modāxelāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مداخله**

**مداخله** / modāxele ، ـها؛ مداخلات/: [عربی]/اسم. ١. کار و رەوتی بەشداری‌کردن ٢. خۆ تێهەڵقورتان ٣. /سیاسی/ دەس‌تێوەردان؛ هەر کارێک لە لایەن یەک یان چەند دەوڵەتەوە بۆ تێکدانی کار و باری دەوڵەتێکی‌تر.

**مداد** / medād ، ـها/: [عربی]/اسم. میداد؛ قەڵەم؛ میدا: ١. قەڵەم‌زرێچ؛ دارینە؛ قەڵەمسێیە؛ پێنووسێک بۆ نووسین، رەسم‌کێشان یان نیشانە دانان ٢. ئامێرێکی وا بە ماکی ئارایشتیەوە بۆ خۆ رازاندنەوە.

▣ **مداد ابرو:** میدادی برۆ؛ میدادێک بۆ ئارایشتی برۆ.

**مداد رنگی:** میدادرەنگی؛ قەڵەمرەنگی؛ کۆمەڵە میدادی رەنگاورەنگ بۆ نەققاشی.

**مداد شمعی:** میداد شەمی؛ میدادی لە مۆم یان پارافین.

**مداد کپیه:** قەڵەم جەوهەر؛ جۆرێک میداد کە نووسراوەکانی ئەستەم پاک دەبنەوە و بۆ نووسینی بەڵگە بەکار دێ.

**مدادپاک‌کن** / medādpak.kon ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. مەساحە؛ خەت‌کوورەوکەر؛ کەرستەیەک لە جنسی جۆرێ لاستیک بۆ سڕین و کوژاندنەوەی شوێنی میداد.

**مدادتراش** / medādtarāš ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. خۆتراش؛ خەزەن؛ قەڵەمتراش؛ تک‌قەڵەمئەوکەر؛ ئامرازی قەڵەم تاشین.

**مدادی** / medādî, madādî/: [عربی] صفت. میدادی: ١. بە میداد نووسراو ٢. رەنگی خۆڵەمێشی تۆخی مەیلە و رەش؛ بە رەنگی گرافیت.

**مدار** / madār ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. خولگە: ١. گەرەکی هەڵخولانی شتێک بە دەوری شتێکی‌تردا ‹مدار زمین بە دور خورشید: خولگەی زەوی بە دەوری خۆردا› ٢. هێڵ؛ گەرەکێکی بازنەیی لە دەوری شتێک ‹مدار استوا: هێڵی ئوستوا› ٣. رێگەی گەرانی وزەی کارەبا.

▣ **مدار چاپی:** خولگەی چاپی؛ رووپەرێک کە هەموو لکە کارەباییەکانی لە سەر داندراوە یان لەحیم کراوە.

**مدار رأس‌الجدی:** خولگەی کارژۆلە؛ هێڵێک لە سەر ′٢٧ °٢٣ی پانتای باشووری گۆی زەوی، کە تیشکی خۆر لە رۆژی یەکەمی بەفرانباردا راست لە سەریەتی و ناوچەی ناوەندی باشووری دەگرێتە بەر.

**مدار رأس‌السّرطان:** خولگەی قرژاڵ؛ هێڵێک

له سەر ′۲۷ °۲۳ پانتای باکووری گۆی زەوی، کە تیشکی خۆر لە ڕۆژی یەکەمی پووشپەڕدا ڕاست لە سەریەتی و ناوچەی ناوەندی باکووری دەگرێتەوە.

**مدارا** / modārā ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. نەرم و نیانی؛ نەرمکێشی؛ ڤەخوراندن ‹با مردم مدارا کن!: لەگەڵ خەڵک نەرمونیان بە!› ۲. خۆڕاگری؛ پشوودرێژی؛ پرزەداری؛ بێنفرەهی ‹با این دشمنان مدارا تا کی؟: لەیەل ئەم دژمنانە پشوودرێژی تا کەنگێ؟›.

**مدارج** / madārec/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* قۆناخگەل، پلە یان پلەکگەل ‹مدارج ترقی: قۆناخگەلی پێشڕەوت›.

**مدارس** / madāres/: [عربی] جمعِ ☜ **مدرسه**

**مدارک** / madārek/: [عربی] جمعِ ☜ **مدرک**

**مدارگان** / madārgān/: [عربی/ فارسی]/اسم. مەڵبەندێک لە گۆی زەوی لە هەر دوو لای هێڵی ئوستوادا کە ئاو و هەوای ناگۆڕێ: **منطقەی حارّە**

**مدارگرد** / madārgard/: [عربی/ فارسی] صفت. خولگەگەڕ؛ بە سووڕانەوەی جەغزئاساوە.

**مدافع**[1] / modāfe' ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. *[ورزش]* پشتگر؛ بەک؛ هەر کام لە یاریکارانی کایەی فووتباڵ کە وان لە پێش دەروازەوان و پشتەسەر یاریکارانی‌ترەوە.

**مدافع**[2]: صفت. پارێزەر؛ بەرگر؛ بەرەڤان؛ بەرەنگار ‹مدافع آزادی: پارێزەری ئازادی›.

**مدافعات** / modāfe'āt/: [عربی] جمعِ ☜ **مدافعه**

**مدافعه** / modāfe'e ، ـها؛ مدافعات/: [عربی]/اسم. بەرگری؛ بەرەنگاری؛ کار و ڕەوتی پاراستن و بەرگری‌کردن.

**مداقه** / modāqqe/: [عربی]/اسم. تێبینی: ۱. کار یا ڕەوتی سەرنج دان و ورد بوونەوە ۲. سەرنج؛ وردی.

**مدال** / medāl ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. مەداڵ؛ میداڵ: ۱. نیشان؛ دروشم؛ کانزایەکی نەخشینی وەک سکە کە بە مەبەستی بیرەوەری کەسایەتی یان ڕووداوێک، یان بۆ خەڵات لێدراوە و لە مل دەکرێ یان بە سەر سینگەوە دەنرێت ۲. گەوهەربەند؛ نەخشی سەر کانزا.

**مدالیون** / medālyon ، ـها/: [؟]/اسم. ۱. گەوهەربەند؛ نەخشی جوانی سەر کانزا و بەردی بەنرخ کە لە ملی دەکەن یان بە جلوبەرگیەوە دەنێن ۲. نەخشی جوانی زەپ لە سەر قاپ، دیوار یان وێنەوە.

**مدام**[1] / modām/: [عربی] صفت. بەردەوام؛ دایمی؛ هەمیشەیی؛ سەرەمڕ ‹عیش مدام: ڕابواردنی بەردەوام›.

**مدام**[2]: قید. هەر؛ دایم؛ دایمە؛ دایمی؛ هەمیشە؛ هەمیشەدەرە؛ دایم و دەرهەم؛ بەردەوام ‹مدام می‌گفت: «من خیلی خستەام»: هەر دەیگوت: «ئەمن زۆر ماندووم»›.

**مداوا** / modāvā ، ـها/: [عربی]/اسم. دەرمان؛ چارەسەر؛ چارە؛ عەلاج؛ کار و ڕەوتی دەرمان کردن؛ چارەکردنی دەرد و برین ‹مداوای او چند ماه طول کشید: دەرمانەکەی چەن مانگی خایاند›.

**مداوم** / modāvem/: [عربی] صفت. هەمیشەیی؛ لێکدا- لێکدا؛ بێ‌پسانەوە؛ تم و تم؛ پەیتا- پەیتا؛ پەستا- پەستا؛ پەسا- پەسا؛ لە سەر یەک ‹کار مداوم؛ سر و صدای مداوم: کاری هەمیشەیی؛ قرموقالی بێ‌پسانەوە›.

**مداومت** / modāvemat, modāvamat/: [عربی]/اسم. بەردەوامی: ۱. بار و دۆخی درێژەدار بوون؛ خایاندن؛ بەردەوام بوون ‹این کار دو ماه مداومت داشت: ئەم کارە دوو مانگ درێژەی هەبوو› ۲. شوێنگری؛ کار و ڕەوتی سوور بوون و بەدوادا چوون ‹مدتی در کارش مداومت نشان داد: ماوەیێ لە کارەکەیدا بەردەوامی نواند›.

**مداهنه** / modāhene ، ـها/: [عربی]/اسم.

زمان‌لووسی؛ زوان‌لووسی؛ زوان‌چەوری؛ ماستاوکەری.

**مدایح** / madāyeh/: [عربی] جمعِ ☜ **مدیحه**

**مدبر** / modabber ، ـان/: [عربی] صفت. بەردەبار؛ بەمشوور؛ بەڕا؛ بەتەگبیر؛ بەڕاوێژ؛ چارەمەند.

**مدبرانه**[1] / modabberāne/: [عربی/ فارسی] صفت. ژیرانە؛ چارەمەندانە؛ چارەسەرانە؛ بە مشوورانە؛ بە تەگبیر؛ بە وردبینی و دوورنوارییەوە ‹راه‌حل‌های مدبّرانه: ڕێچارگەلی ژیرانە›.

**مدبرانه**[2]: قید. ژیرانە؛ بە مشوور؛ بە ڕاوێژ؛ بە بەکاربردنی ڕا و تەگبیر؛ بە وریایی ‹اختلاف‌ها را مدبرانه حل و فصل کرد: ناکۆکیەکانی ژیرانە چارەسەر کرد›.

**مدپرست** / modparast ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] صفت. باوپەرست؛ هۆگر و شوێنکەوتووی باوی تازە. هەروەها: **مدپرستی**

**مدت** / moddat/: [عربی]/سم. مده؛ ماوە؛ مەودا: ۱. بەروبۆ؛ کاتی پێویست بۆ تەواو بوونی کار، خول یان زنجیرەڕووداوێک ‹مدت عمر؛ مدت تحصیل: ماوەی تەمەن؛ ماوەی خوێندن› ۲. کاتێک بە سەرەتا و ئاخری دیاریکراوەوە ‹مدت کار روزانه، هشت ساعت است: ماوەی کاری ڕۆژانە هەشت سەعاتە› ۳. ـها/ پاژێک لە کات ‹مدت شب و روز در تابستان و زمستان متفاوت است: ماوەی شەو و ڕۆژ لە هاوین و زستاندا جیاوازە›.

**مدت‌دار** / moddatdār/: [عربی/ فارسی] صفت. ماوەدار؛ مەودادار؛ پێوەندیدار یان سەر بە ماوەیێکی دواترەوە ‹چک مدتدار: چەکی ماوەدار›.

**مدح** / madh ، ـها/: [عربی]/سم. پەسن؛ ڕەوش؛ تاریف؛ ستایشت: ۱. کاری پێدا هەڵدانی کەسێ یا شتێ و گوتنی باشی و لێهاتوویيەکانی. بەرانبەر: **قدح** ‹شاعران او را مدح می‌کردند: شاعیران پەسنیان دەداوە› ۲. ئەوەی لەم بارەوە هەڵدەگوترێ ‹بسیار مدح او را گفتند و نوشتند: زۆریان پەسندا و نووسیانەوە›.

⊡ **مدح کردن/ گفتن**: پێدا هەڵگوتن؛ پیا هەڵدان؛ پەسندان؛ ئەڤراختن؛ پێهەڵگوتن.

**مدحیات** / madhîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مدحیه**

**مدحیه** / madhîyye ، ـها؛ مدحیات/: [عربی]/سم. دولگە؛ شیعر، قسە یان نووسراوەیەک بۆ پەسندانی کەسێک.

**مدخل** / madxal ، ـها/: [عربی]/سم. ۱. دەم؛ زارک؛ دەروو؛ دەر؛ ناودەر؛ ناڤدەر؛ درگا؛ دەمدەر؛ بەردەر؛ بەردەرک؛ شوێنێک بۆ تێوەچوون ۲. پێشەکی؛ دەسپێک ۳. لێما؛ لێمە؛ سەرواژە؛ سەروشە؛ هەر کام لە وشەگەلی سەرەتایی وشەدان، فەرهەنگ یان فەرهەنگۆک کە مانای دراوەتەوە، بەرامبەرەکانی نووسراوە و...

**مدد** / madad ، ـها/: [عربی]/سم. یاریدە؛ ئاریکاری؛ یارمەتی؛ یاریەتی؛ یاردەی؛ کۆمەک.

⊡ **مدد خواستن**: داوای یارمەتی‌کردن؛ یاری خواستن؛ کۆمەک گەرەک بوون؛ یاردەی واستەی. هەروەها: **مدد رساندن؛ مدد کردن**

**مددجو** / madadcû ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی]/سم. ۱. یاریخواز؛ کۆمەک‌خواز؛ ئەوەی پێویستی بە یارمەتیە ۲. تازەلاوی تاوانبار لە ناوەندی چاکسازی و پەروەردەدا. هەروەها: **مددجویی**

**مددکار** / madadkār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/سم. مەدەدکار؛ ئاریکار: ۱. یارمەتیدەر؛ فریاڕەس ۲. ئەوەی لە ناوەندی چاکسازی و پەروەردەدا کار دەکا.

⊡ **مددکار اجتماعی**: ئاریکاری کۆمەڵایەتی؛ ئەوەی بۆ چاکسازی و یارمەتیدانی لێقەوماوان ڕاهاتووە.

**مددکاری** / madadkārî/: [عربی/ فارسی]/سم. ئاریکاری؛ مەدەدکاری: ۱. ـها/ کاری یاری گەیاندن ۲. پیشەی ئاریکار.

⊡ **مددکاری اجتماعی**: ئاریکاری کۆمەڵایەتی؛

چەشـنێک چـالاکی کۆمەڵایـەتی بـۆ یارمەتیدانی لێقەوماوان.

**مددیار** / madadyār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. مەدەدیار؛ یاریدەر؛ بەردەستی ئاریکار.

**مددیاری** / madadyārî/: [عربی/ فارسی]/اسم. مەدەدیاری؛ یاریـدەری: ۱. بـواریکی خوێندەواری بۆ فێرکـردن و ڕاهێنـانی یاریـدەر ۲. پیشە و کاری یاریدەر.

**مدر** / moder(r)/: [عربی] صفت. ئاسان‌کـەر و زۆرکەرەوەی ڕێژەی میز.

**مدرج** / modarrac/: [عربی] صفت. پلیکانـە؛ پێچینـە؛ پاچێنـە؛ نقـرـ نقـر؛ پلەـ پلـە؛ دەرەجەـدەرەجە؛ پلەک ـ پلەک؛ دەرەجەبەندی کـراو ‹رادیـو دارای صفحەی مـدرج اسـت: ڕادیـۆ پەڕەیەکی پلیکانەی هەیە›.

**مدرس** / modarres ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. ۱. ئـەوەی دەرس ئـەدات: الـف) هینکـار؛ هەڤـۆتکار؛ ئـەوەی لـە قوتابخانەیـەکی دینیـدا دەرس ئەداتەوە ب) خوارترین پلەی مامۆسـتایی لە زانستگادا ۲. فێرکار؛ دەرسبێژ (بەگشتی).

**مدرسه** / madrese, madrase ، ـها؛ مـدارس/: [عربی]/اسم. فێرگـە: ۱. قوتابخانـە؛ خۆنـدنگا؛ مەکتەب؛ مەدرەسە؛ دەرسخانە؛ جێگەی دەرس خوێندن: الـف) شـوێنی فێرکـردنی منـداڵان و تازەلاوان بە پێـودانگی بەرنامەیـەکی دیـاریکراو ب) شوێنی فێرکردنی زانستی دینی ۲. فێرگـە؛ دامەزراوەی فێرکاری ‹مدرسەی کشاورزی: فێرگەی کشت‌وکاڵ›.

▣ مدرسـەی ابتـدایی: خۆنـدنگای سـەرەتایی؛ قوتابخانەی سەرەتایی

مدرسەی راهنمایی: خۆندنگای ناوەندی.

مدرسەی شبانەروزی ☜ **شبانەروزی**[1]

مدرسەی عالی: دامەزراوەی فێرکاری باڵا، لـە ئاستی کارناسی (لیسانس).

مدرسەی غیرانتفاعی: مەدرەسـەی نادەوڵـەتی کە بە گـرتنی پـارە لـە خوێنـدکاران بـەڕێوە دەچێ.

مدرسەی متوسطە: دەبیرستان؛ قوتابخانەی دوا ناوەندی.

**مدرسەای** / madrese'î, madrase'î/: [عربی/ فارسی] صفت. [گفتاری] مەدرەسەیی؛ قوتابخانەیی؛ فێرگەیی؛ پێوەندیـدار یـان سـەر بـە قوتابخانـە ‹دختر مدرسەای: کچە مەدرەسەیی›.

**مدرسـەداری** / madresedārî, madrase-/: [عربی/ فارسی]/اسم. قوتابخانـەداری؛ کـار و ڕەوتی گەڕاندن و بەڕێوە بردنی قوتابخانە.

**مدرسـەرو** / madreserow, madrase- ، ـهـا/: [عربی/ فارسی] صفت. مەدرەسـەیی؛ قوتابخانـەیی؛ بـە تەمـەن یـان دۆخـی شـیاو بـۆ چوونـە قوتابخانەوە.

**مدرسـەسـازی** / madresesāzî, madrase-/: [عربی/ فارسی]/اسم. قوتابخانەسازی؛ فێرگەسـازی؛ کار و ڕەوتی کردنەوەی قوتابخانە.

**مدرسی**[1] / madrasî/: [عربی]/اسم. مەدرەسی؛ قسەوباسـی فەلسـەفی و بـیروڕای قوتابخانـەیی ئوروپا لە چەرخە ناوەندیەکاندا.

**مدرسی**[2]: صفت. قوتابخانـەیی؛ پێوەندیـدار یـان سەر بە قوتابخانە.

**مدرسی** / modarresî/: [عربی]/اسم. فێرکـاری؛ هینکـاری: ۱. دەرسـبێژی؛ مامۆسـتایی؛ کـاری مامۆستا ۲. کار و ڕەوتی دەرس دان.

**مـدرک** / madrak ، ـها؛ مـدارک/: [عربی]/اسم. نفیسک؛ بەڵگە؛ مـەدرەک: ۱. دەسـخەت یـان نووسراوەیەکی ڕەسمی بۆ دەلیل یان پشـتیوانی لە داوا یان گومانێک ۲. ئـەوەی دەبێتـە بەڵـگە (وەک وێنە، شریتە، نووسراوە و...) ۳. بەڵـگەنامە؛ سەنەد ‹سند زمین: بەڵگەنامەی زەوی›.

▣ مـدرک تحصـیلی: بڕوانامـەی خوێنـدکاری؛ نووسـراوەیەکی ڕەسمـی کـە تێپـەڕ بـوونی خولێکی خوێندەواری کەسێ پیشان دەدا.

مدرک تخصصی: بڕوانامەی پسپۆڕی.

**مدرکات** / modrakāt/: [عربی]/اسم. کۆی ئەو شتانەی هەستیان پێ دەکرێ.

**مدرک‌گرایی** / madrakgerāyî/: [عربی/ فارسی] /اسم. واز و تامەزرۆیی زۆر بۆ وەرگرتنی بڕوانامەی خوێندکاری بەبێ بایەخدان بە فێر بوون.

**مدرن** / modern ، ـها/: [فرانسوی] صفت. نۆباو: ١. تازەباو؛ سەر بە سەردەمی ئێستا یان ڕابردووی نزیک ‹جامعەی مدرن: کۆمەڵگای تازەباو› ٢. ساز و تەیار بە شێوەگەلی زانستی یان هونەری تازەوە ‹هواپیمای مدرن: فڕۆکەی نوباو›.

**مدرنیتـــه** / modernîte/: [فرانسوی]/اسم. نوێخوازی؛ نوێوازی؛ نوێگەری؛ نۆباوی؛ تازەگەری، خازما لە دیاردەگەلی کۆمەڵایەتیدا.

**مـدرنیزه** / modernîze ، ـها/: [فرانسوی] صفت. بەڕۆژ؛ نۆکراو و ساز بەپێی ئامێر، کەرستە، شێواز، سەلیقە یان کەلکی ئەمڕۆیی.

**مدرنیست** / modernîst ، ـها/: [فرانسوی] صفت. نوێخواز؛ نوێواز؛ نوێگەر.

**مدرنیســـم** / modernîsm/: [فرانسوی]/اسم. مۆدڕنیسم: ١. گرەوشتێک لە هونەر، نژیارڤانی، بیر و وێژە لە دوای ڕۆنسانسی ئورووپا لە دژی شێوە، شێواز و دابونەریتی باوی کۆمەڵگا ٢. نوێوازی؛ نوێخوازی؛ نوێگەری.

**مدساز** / modsāz ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. باوداهێن؛ ئەوەی شتی نوێ بەتایبەت جلوبەرگ دادێنێ و دەیکاتە باو.

**مـدعا** / modda'ā ، ـها/: [عربی]/اسم. داخوازە؛ داواکراو.

**مـدعو** / mad'ov(v) ، ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. داوەت‌کراو؛ لێ‌گیراو؛ بانگ‌هێڵراو؛ داوەتی؛ ڤەخوەندی؛ بانگ‌کراو بۆ شوێنێ، بەتایبەت میوانی، کۆڕی جێژن یان وتاربێژی.

**مدعی** / modda'î ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. داواکەر: ١. داواکار؛ داواچی؛ ئەو کەسەی خواستێک دێنێتە گۆڕێ ‹مدعی می‌گوید این مال من است: داواکار دەڵێ ئەوە هی منە› ٢. ئەوەی شەڕ و داوای لەگەڵ کەسێکدا هەیە ‹مدعی که نمی‌تواند قاضی باشد: داواکەر خۆ ناتوانێ داوەر بێ› ٣. *[حقوق]* خوازەر؛ گازەندەکەر؛ سکالاکەر؛ دادبەر؛ شکاتکەر؛ ئەوەی شکاتی کەسێکی کردووە ‹مدعی اظهار می‌کند شما او را کتک زده‌اید: داواکەر دەڵێ ئێوە لێتان داوە›.

**مـدعی‌العمـوم** / modda'îyol'omûm/: [عربی] اسم. *[حقوق]* دادئەستێن؛ دادسان؛ دادستان.

**مـدعی‌علیـه** / modda'ā'alayh/: [عربی]/اسم. *[حقوق]* پاشمار؛ شکات لێ‌کراو.

**مدغم** / modqam/: [عربی]/اسم. *[دستور]* پیتێ کە تێکەڵ بە پیتێکی‌تر بووە و سواوە، وەک «بَتَر» کە لە بنەڕەتدا «بدتَر» بووە، دالەکە لە گوتاردا تێکەڵ بە تێ بووە و نەماوە.

(تێبینی: ئەم دیاردەیە زمانیە لە کوردیشدا هەیە. وەک «هەژار» دەڵێ: «تۆزێ لەو خاکە بەسەر خۆتا کە!»، «خۆتا» لە سەرەتادا «خۆتدا» بووە).

**مدفن** / madfan ، ـها/: [عربی]/اسم. ناشتنگە؛ جێ نێژران (وەک گۆڕ، قەبر) ‹مدفن مستوره در سلیمانیه است: ناشتنگەی مەستوورە لە سلێمانیدایە›.

**مدفوع** / madfû'/: [عربی]/اسم. پیسی؛ پیسایی؛ گووڕ؛ گ؛ گی؛ مرداری؛ ڕیخێ کە لە ڕێخۆڵەی مرۆڤ و گیاندارانی‌ترەوە دەردەچێ.

**مـدفون** / madfûn/: [عربی] صفت. نێژراو؛ بن‌گڵ‌خراو؛ سراویا؛ ناشتوو؛ ناشتی؛ تەمراو.

◘ **مدفون کردن**: ١. ناشتن؛ نیان؛ مردوو لە قەبر نان ٢. کردنە ژێر خاکەوە؛ شاردنەوەی شتێ لە ژێر خاکدا.

**مـدقال** / medqāl/:/اسم. متقاڵ؛ جاو؛ جاوە؛ جاوگ؛ قوماشی بەنی ساکار و درشت‌چن: **متقال**

**مـدل** / model ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. مودێل:

۱. *[نامتداول]* نموونه؛ نمانا؛ سەرمەشق ۲. گەلاڵە و نموونەی شتێ کە قەرارە دروست بکرێت ‹مدل هواپیما: مودێلی فرۆکە› ۳. فرم؛ شێواز یان چۆنیەتی دروستکردنی شتێک ‹ماشین آخرین مدل: ماشینی ئاخر مودێل› ٤. کەسێ کە لە دەم و چاو یان ئەندامانیتری بۆ مەبەستێکی هونەری، فێرکاری یان بانگەشەیی وێنە یان پەیکەر چێ دەکەن ٤. جۆرێ کتێبی فێرکاری نەقاشی.

**مدلل** / modallal/: [عربی] *صفت.* بەڵگەدار؛ بە بەڵگە ‹سخنان مدلل: قسەی بەڵگەدار›.

**مدلول** / madlûl ، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* ۱. مەبەست؛ مانا یان ئامانجی وتە یان نووسراوە، بەتایبەت مراز و ئامانجە سەرەکیەکەی.

**مدم** / modem ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* مودیم؛ دەزگای گۆڕانی نیشانەیەک بە نیشانەگەلی تەبا دەگەڵ دەزگایەکیتردا و ڕاگواستنیان (وەک گۆزانەوەی زانیاری لە کەمپیوتریکەوە بۆ کەمپیوتریکیتر): **مودم**

**مدمغ** / modammaq/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ۱. خۆ بەزلزان؛ خۆپەسەن ۲. گەمۆر؛ مەجووجە؛ مژمۆر؛ ناوچاوتاڵ.

**مدنی** / madanî/: [عربی] *صفت.* ۱. نیوولاتی؛ ولاتی؛ ولایەتی؛ سەر بە ولات ‹سازمان مدنی: ڕێخراوەی نیوولاتی› ۲. شارستانی؛ بازێروانی؛ بازێرڤانی؛ ژیاری؛ سەر بە ژیان و کۆمەڵگای شارستانی ‹حیات مدنی: ژیانی شارستانی› ۳. مەدینەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە شاری مەدینە لە عەرەبسان ٤. تایبەتمەندی برێ لە سوورەتەکانی قورعان کە لە مەدینەدا هاتوون.

**مدنیت** / madanîyyat/: [عربی] *اسم.* ژیاری؛ شارستانێتی؛ شارستانیەتی.

**مدور** / modavvar/: [عربی] *صفت.* خرت؛ خڕ؛ غڕ؛ خشت؛ گورمک؛ گلۆر؛ گر؛ گرد؛ گردڵ؛ سەل؛ گلینک؛ لەنگەری؛ چەرخی؛ تۆپەڵ؛ جەغزی ‹صفحەی مدور: پەڕەی خرت›.

**مدولاسیون** / modulās(i)yon/: [فرانسوی] *اسم.* ۱. *[فیزیک]* گۆڕانی برێ تایبەتمەندی شەپۆل بە گوێرەی شەپۆلێکیتر لە هەوالنێری بێتەلدا ۲. *[موسیقی]* ڕاداشتنی ئاهەنگێک لە پلەک یان مودێکەوە بۆ پلەک یان مودێکیتر.

**مدون** / modavvan/: [عربی] *صفت.* کۆوەکراو؛ تۆمارکراو؛ ڕێکخراو؛ کۆکراوە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک ‹قانون مدون: قانوونی کووەکراو›.

**مدهش** / modheš/: [عربی] *صفت. [ادبی]* بەسام؛ ترسهێن؛ ترسناک؛ ڕۆحتۆقێن؛ زاڵەترەکێن؛ زۆر ترسێنەر ‹حادثەی مُدهش: ڕووداوی بەسام›.

**مدهوش** / madhûš ، ـان/: [عربی] *صفت. [ادبی]* بێهۆش؛ نەهش؛ نهش؛ دڵبووراو؛ دڵبووراوە؛ لەهۆش چوو؛ لەسەرخۆ چووگ ‹ناگهان مدهوش شد و افتاد: لە ناکاودا بێهوش بوو و دارایەوە›.

▣ **مدهوش شدن**: بوورینەوە؛ بوورانەوە؛ دڵ بوورین؛ لەهۆش چوون؛ بێهۆش بوون؛ لەسەرخۆ چوون؛ دڵ ڕووین؛ بێتار بوون؛ بێهۆش کەوتن؛ لەپڕین؛ ویەردەیوە.

**مدیحە** / madîhe ، ـها؛ مدایح/: [عربی] *اسم.* دولگە؛ پەسننامە؛ ئەوەی (زۆرتر شیعر) کە لە پەسنی کەسێکدا دەگوترێ.

**مدیحەسرا** / madîhesarā ، ـیان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دولگەوێژ؛ دولگەهۆن؛ پەسنبێژ؛ هۆگری پێدا هەڵگوتن و پەسن دان. هەروەها: **مدیحەگو؛ مدیحەسرایی؛ مدیحەگویی**

**مدید** / madîd/: [عربی] *صفت.* دوور و درێژ؛ ئازگار؛ درێژ؛ درێژخایەن ‹مدت مدید: ماوەی دوور و درێژ›.

**مدیر**[1] / modîr ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* کارگێڕ؛ بەڕێوەبەر؛ ڕێڤەبەر؛ هەڵسووڕێن؛ ئەو کەسە بەڕێوە بردنی دامەزراوەیەکی لە ئەستۆدایە ‹مدیر فروشگاه: کارگێڕی فرۆشگە›.

▣ **مدیر داخلی**: کارگێڕی ناوەخۆ؛ بەڕێوەبەری

ناوخۆیی؛ بەرپرسی هەڵسووڕاندنی کار و باری ناوەکی دامەزراوەیەک.

**مدیر عامل:** کارگێڕی گشتی؛ بەرزترین پلەی بەڕێوەبەرایەتی دامەزراوەیێ کە لە لایەن تاقمی بەڕێوەبەرایەتیەوە هەڵدەبژێردرێت.

**مدیر کل:** بەڕێوەبەری گشتی؛ ئەوەی بەڕێوەبەرایەتی مەزرینگەیەکی لە ئەستۆدایە.

**مدیر مسئول:** بەرپرس؛ ئەو کەسەی لەمەڕ پیشە یان کارێکی تایبەت (وەک بلاوکردنەوەی رۆژنامە) ئەرکی وەلام دانەوە بە دام و دەزگا دەوڵەتیەکانی لە ئەستۆدایە.

**مدیر**[2]: *صفت.* بەمشوور؛ لێهاتوو بۆ سامان دان و بەڕێوەبردنی کار و بار.

**مدیریت** / modîrîyyat/: [عربی]/*اسم.* بەڕێوەبەرایەتی؛ کارگێڕی: ١. /ـها/ کار و ڕەوتی هەڵسووڕاندن ٢. /ـها/ لێهاتوویی و لێزانی لە بەڕێوە بردندا ٣. کۆی ئەو کەسانەی کارێک هەڵدەسووڕێنن ‹مدیریت کارخانه: بەڕیوبەرایەتی کارخانە› ٤. کار و پیشەی بەڕێوەبەر.

**مدیست** / modîst ، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* باوداهێن؛ ئەو کەسەی شتی نوێ دەکاتە باو.

**مدینەی فاضله** / madîneyefāzele/: [عربی] ☜ **آرمانشهر**

**مدیون** / madyûn/: [عربی] *صفت.* ١. *[حقوق]* قەرزدار؛ قەرزار ‹شما پولی به این شرکت مدیون هستید: ئێوە پارەیەک قەرزداری ئەم بەشدارگەیەن› ٢. *[گفتاری]* منەتبار؛ دەیندار؛ دۆخی خۆ بە وامداری چاکەیەک زانین.

**مدیونی** / madyûnî/: [عربی]/*اسم.* منەتباری؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی دەیندار بوون.

**مذاب** / mozāb/: [عربی] *صفت.* تواوە؛ تاویاوە؛ تاویاو؛ تاویاگەوە؛ بوهوژ؛ بوهوژتی؛ ئەوەتاویا؛ بڤاشت؛ پشافت؛ لە بەر گەرمای زۆر وەک هەویر یان ئاو لێهاتوو.

**مذاق** / mazāq/: [عربی]/*اسم.* ١. *[نامتداول]* چێژایی؛ ئەندامی چێشتن ٢. *[مجازی]* دڵ؛ سەلیقە؛ پەسن؛ زەوق ‹به مذاق کسی خوش آمدن: بە دڵی کەسێک بوون›.

**مذاکرات** / mozākerāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مذاکره**

**مذاکره** / mozākere ، ـها؛ مذاکرات/: [عربی]/*اسم.* وتوویژ؛ قسەوباس؛ مچلگە؛ لێکدوانی بەتایبەت رامیاری نێوان دوو یان چەن کەس ‹وزرای دو کشور مدتی مشغول مذاکره بودند: وەزیرانی دوو وڵاتەکە ماوەیەک خەریکی وتوویژ بوون›.

**مذاهب** / mazāheb/: [عربی] جمعِ ☜ **مذهب**

▣ **مذاهب اربعه:** چوارمەزەبی ئەهلی سوننەت، کە بریەتین لە: حەنەفی، شافیعی، حەنبەلی و مالیکی.

**مذبح** / mazbah ، ـها/: [عربی]/*اسم.* *[ادبی]* قوروانگە؛ قوربانگە؛ کوشتارگا؛ شوێنی سەربڕین و قوربانی کردن.

**مذبذب** / mozabzab/: [عربی] *صفت.* ١. تاوتاوی؛ ڕا ــ ڕا؛ دەمدەمی؛ هۆکی ــ هۆکی؛ وازوازی؛ بێتوانستی بڕیاردان ٢. ڕووگیر؛ لە ڕوو داماو؛ بەبێ ڕاشکاوی و ڕووڕاستی لە دەربڕینی بیر و باوەڕدا.

**مذبوحانه** / mazbûhāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بەفیڕۆ؛ لەناچاری؛ ناچاری؛ بە ناعیلاجی و لە خۆڕایی ‹تلاش مذبوحانه: هەوڵی بەفیڕۆ›.

**مذکر** / mozakkar ، ـها/: [عربی] *صفت.* نێر؛ نێرینە؛ نێرەوەز ‹حیوان مذکر: گیانداری نێر›.

**مذکور**[1] / mazkûr/: [عربی] *صفت.* ناوبراو؛ نێوبراو؛ ناڤبری؛ باسکراو؛ باس لێ کراو ‹موضوع مذکور در سند قید شده است: بابەتی باسکراو لە بەڵگەکەدا هاتووە›.

**مذکور**[2]: ضمیر. ناوبراو؛ نێوبراو؛ ناڤبری؛ باسکراو؛ کەس یان شتێ کە پێشتر ناوی هاتووە ‹شخص مذکور مدتی در بیمارستان بود: ناوبراو ماوەیەک لە نەخۆشخانە بوو›.

**مذلت** / mazallat, mazellat ، ـها/: [عربی]/اسم. سووکی؛ زەلیلی؛ خواری؛ زەبوونی؛ پەستی.

**مـذمت** / mazammat, mazemmat ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. *[ادبی]* زەم؛ زەمـە؛ فـڕ؛ ڤـر؛ خراپـەبێژی ٢. لۆمـە؛ لـۆم؛ تانـە؛ سەرزەنشـت؛ سەرکۆنە؛ سەرکۆ؛ ولە.

**مـذموم** / mazmûm/: [عربی] صفت. *[ادبی]* کەسن؛ کرێت؛ ناشـیرین؛ ناپەسـەن؛ ناپەسـەند؛ زشت؛ نەچیٚ؛ ناحەز؛ سک؛ دشت.

**مـذهب** / mazhab ، ـها؛ مذاهب/: [عربی]/اسم. ڕێبـاز: ١. مـەزەب؛ مـەزەو؛ مەسـەو؛ مەسـەب؛ ئایین؛ دیژە؛ کۆمەڵە ئامۆژەگەلی دینیٚ کە تەنیا تاقمیٚ لە پەیڕەوانی ئـەو دینـە لـە سـەری بـن ‹مذهب شافعی: ڕێبازی شافیعی› ٢. *[مجازی]* دیـن ‹مذهب بودا: دینـی بودا› ٣. *[نامتداول]* قوتابخانەی هزری یان فەلسەفی.

◘ **مذهب آنگلیکان:** ڕێبازی ئانگلیکان؛ ڕێبازێکی مەسیحی کە لە ساڵی ١٥٣٤ی زایینیـەوە لـە ئینگلستان دامەزراوە: **کلیسای آنگلیکان**

**مـذهب ارتـدکس:** ڕێبـازی ئورتـودوکس؛ ڕێبازێکی بنەماخوازی دینی مەسیحی کە لـە سەدەی پێنجەمدا و لە ئەنجامی سەربادان لە فەرمانی پاپی دووهەم، لە ناو خـاچپەرسـتانی ڕۆژاوادا سەری هەڵدا: **کلیسای ارتدکس**

**مذهب پرتستان:** ڕێبازی پروتستان؛ هـەر کـام لـە ڕێبازەکـانی مەسـیحی کـە لـە چـەرخی شازدەهەمەوە لە لایەن چاکەخوازانی دینیەوە سەریان هەڵداوە و ملیان بە سەرۆکایەتی پاپ نەداوە: **کلیسای پروتستان**

**مذهبت را شـکر:** *[گفتاری]* بـە زیـا نـەبیٚ؛ بـە زیادی نەکەی؛ هـەی وەچەمـەری کـەی (بـۆ دەربـڕینی نارەزایـەتی یـان سەرسـووڕماوی دەگوتریٚ) ‹مذهبت را شکر دوباره بـرق رفـت!: بـە زیادی نەکەی دیسانەکە بەرق چوو!›

**مذهب کاتولیک:** ڕێبازی کاتولیک؛ یەکێک لە ڕێبازەکانی مەسـیحی کـە پـاپ بـە جێگـری ڕاستەوخۆی پیتروسی ڕەسووڵ دەزانـیٚ و لـە سـەر سەڵـت و ڕەبـەن مانـەوەی پایـەدارانی کلیسا پێداگری دەکا: **کلیسای کاتولیک**

**مذهَب** / mozahhab/: [عربی] صفت. ١. تەزهیب کراو ٢. *[نامتداول]* زێڕکەفت؛ زەڕکەفت؛ زێـڕکفت؛ زەڕکەش؛ زێڕکری.

**مـذهِّب** / mozahheb/: [عربـی]/اسـم. ١. تـەزهیبکـار ٢. زێـڕکار؛ زەڕگـەر؛ تـەلاکار؛ زێڕینگەر؛ ئەو کەسەی پیشەی زێڕکاریە.

**مذهبی** / mazhabî/: [عربی] صفت. مەزهـەبی؛ ڕێبازی: ١. پێوەندیدار یـان سـەر بـە ڕێبازێـک ‹احـزاب مـذهبی: پارتـە مەزهەبیـەکان› ٢. /ـها/ دینـدار؛ بڕوامەنـد و لایـەنگری مەزهـەب ‹آدم مذهبی: مرۆی دیندار›.

**مر** / mor(r)/: [عربی]/اسم. مـایرە ١. دەوەنێکـی ناوچەی گەرمێن لە تـیرەی سمـاق ٢. جـەوی خەست و سپی ئەو دەوەنە کـە بـۆنی خۆشـە و تامی تاڵە، لە بەر هـەوادا ڕەنـگ دەگـۆڕیٚ و بـۆ دەرمان دەبیٚ.

**مرا** / marā/: ضمیر. *[ادبی]* من؛ ئـەمن؛ ــمـ ؛ ـم؛ مە؛ جێناوی بەرکاری یەکەمکەسـی تـاک ‹ مـرا گفت؛ مرا دید؛ مـرا آورد: منـی گـوت؛ دیتمـی؛ مـە ئاورد›.

**مرابحـه** / morābehe/: [عربـی]/اسم. کـاری وەرگرتن یا دانی وام بۆ ماوەیێکی دیاریکراو لـە بەرامبەر سوودێکی دیاریکراوەوە.

**مـرأةالمسلسـله** / mar'ātalmosalsale/: [عربـی] ☜ زن پای در زنجیر، **زن**

**مراتب** / marāteb/: [عربی] جمعِ ☜ **مرتبه**

**مراتع** / marāte'/: [عربی] جمعِ ☜ **مرتع**

**مراثی** / marāsî/: [عربی] جمعِ ☜ **مرثیه**

**مراجع** / marāce'/: [عربی] جمعِ ☜ **مرجع**

**مراجـع** / morāce' ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی]/اسم. کارهێن؛ کەسیٚ کە بۆ جێبەجیٚ بـوونی کـاری،

سەردانی شوێنێک دەکا ‹رفتارش با مُراجع ملایم و محترمانـه بـود: لەگـەڵ کارهێنـدا بـەڕێزەوە دەجووڵایەوە›.

**مراجعـات** / moräce'āt/: [عربی] جمعِ ☜ **مراجعه**

**مراجعت** / moräce'at/: [عربی]/سم. کار و ڕەوتی گەڕانەوە؛ هاتنەوە؛ ئەوەئامەی؛ هەڵگەڕانەوە.

**مراجعه** / moräce'e ، ـها؛ مراجعات/: [عربی]/سم. ١. کار و ڕەوتی سەردان؛ چوون بـۆ شـوێنێ یـا لای کەسێ بۆ کـارێ ٢. کـاری گـەڕان بـە نـاو کتێب و نووسراواندا بۆ بابەتێک.

**مراحل** / marāhel/: [عربی] جمعِ ☜ **مرحله**

**مراحم** / marāhem/: [عربی] جمعِ ☜ **مرحمت**

**مراد** / morād/: [عربی]/سم. ١. ئـارەزوو؛ مـراز؛ مـراد؛ کـاو؛ کـام؛ حـەز؛ نیـازی دڵ؛ خواسـت؛ ویست؛ ئـاوات ٢. پـیر؛ کەسـێ کـە خەڵـکێک مریدی وین.

▣ **مراد طلبیدن**: ئاوات خواستن؛ داوای ئـاوات و نیازی دڵ کردن.

**به مراد خود رسیدن**: به مرادی خۆ گەییشتن؛ گەیینە مـرازی خـۆ؛ بـە مـراد/ نیـاز/ ئـاوات/ ئارەزووی دڵی خۆ گەیشتن ‹سارا هـم سر کـار رفت و به مراد خود رسید: ساراش چووە سەر کـار و به مرادی خۆی گەییشت›.

**مرادف** / morādef ، ـها/: [عربی] صفت. هاوسـان؛ هاوتا؛ هاوڕزن؛ هاوڕیز؛ هاوشان.

**مرارت** / marārat ، ـها/: [عربی]/سم. مـەرارەت: ١. تاڵی؛ ناخۆشی؛ ناوەشی؛ کوڵ‌وکەسەر؛ تـاڵاو ٢. *[مجازی]* جەور؛ دەرد و سـەختی؛ کەزلاتـەی؛ تاڵ‌وسوێری و تەنگ و چەڵەمەی ژیان.

**مرارت بار** / marāratbār/: [عربی/ فارسی] *صفت.* پڕ (لـە) ژان؛ پڕ لە چەرمەسەری؛ پـڕ لـە دەرد و خەفەت ‹زندگی مرارت‌بار: ژیانی پڕ لە ژان›.

**مراسـلات** / morāselāt/: [عربـی] جمـعِ ☜ **مراسله**

**مراسله** / morāsele ، ـها؛ مراسلات/: [عربی]/سم. ١. نامە؛ نووسـراوەی هـەناردراو بـۆ شـوێنێ ‹در مراسلەی خود از وضع کارتان شکوە کـردە بودیـد: لـە نامەکەتاندا گلـەییتان لـە بـار و دۆخـی کارەکـەتان کردبـوو› ٢. *[قـدیمی]* نامـەنێری؛ نامـەوەگۆڕی؛ نامەنیگاری؛ کاری نامە ناردن.

**مراسـم** / marāsem/: [عربـی]/سم. ڕێ‌وڕەسـم؛ ئاهەنگ؛ ئایین؛ کۆمەڵـەکارێ کـە بـە گـوێرەی قانوون، داب و نەریت یان باوە، بۆ بـەڕێوە بـردنی بۆنە یـا مەبەسـتێکی تایبـەتی ڕەچـاو دەکـرێ ‹مراسم عید نوروز: ڕێ‌وڕەسمـی جێژنی نەورۆز›.

▣ **مراسم تحلیف**: ئاهەنگ/ ڕێ‌وڕەسمی سـوێند خواردن؛ ئاهەنگی ڕەسمی بۆ قەسەم خواردن لـە پـێش چـاوی خەڵـک ‹مراسـم تحلیـف دانشـجویان پزشـکی: ئاهـەنگی سـوێند خـواردنی خوێندکارانی بژیشکی›.

**مراسم تدفین**: ڕێ‌وڕەسمـی بـە خاکسـپێری/ ئەسپەردەکردن/ سراونەی؛ ڕەوتی ناشتن و بە خاک سپاردنی مردوو.

**مراعـات** / morā'āt ، ـها/: [عربـی]/سم. کـار و ڕەوتی لە بەر چاوگرتن.

▣ **مراعات نظیر**: نووسراوەیەک (زۆرتر شیعر) کـە ئەو شتانەی پێک‌دێن و بە یـەکتری دەخـۆن تێیـدا ڕیزکـراوە (وەک «خـەزان» و «بـەهار» و «چەمەن» و «گـوڵ» و «سـەرو» و «سـەمەن» و «یاسەمەن» لەم شیعرەی «نـالی»دا: لـە خـەزان بێ‌خەبەرە بەرگی بـەهار و چەمـەنی/ بـێ‌بـەقایی گوڵ و سەرو و سەمەن و یاسەمەنی): **تناسب ـ٤**

**مرافعات** / morāfe'āt/: [عربی] جمعِ ☜ **مرافعه**

**مرافعـه** / morāfe'e ، ـهـا؛ مرافعـات/: [عربـی]/سم. ١. *[نامتـداول]* داوخـوازی؛ دادخـوازی؛ داخـوازی ٢. *[گفتـاری]* دەمەقڕێ؛ دەمقـڕ؛ جەنگـەمرینگێ؛ مەرافە؛ داوا؛ سواژ؛ سواش؛ چەقە و هەرا؛ شـەڕ و هەرا ‹دیشب با زنم مرافعه داشتیم: دوێشـەو لەگـەڵ ژنەکەمدا دەمەقڕێمان بوو›.

**مراق** / marāq/: [عربی]/اسم. مەراق: ١. *[گفتاری، قدیمی]* تاسە؛ جۆرێ نەخۆشی کە ڕشانەوەی پەیتاـ پەیتا، بێحالی و هەستی دڵتەنگی لەگەڵایە ٢. *[نجوم]* لە ئەستێرە گەشەکانی ئاسمان، لە وێنەی ئاسمانی ورچی گەورەدا.

**مراقب**[1] / morāqeb ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. کەتوان؛ چاودێر؛ چاوێر؛ چاوەدێر؛ هەڤچاڤ؛ چاڤێر؛ سەرپاڵە؛ دیدەبان ‹برایش دوتا مراقب گذاشته بودند: دوو چاودێریان بۆ دانابوو›.

**مراقب**[2]: صفت. ئاگادار؛ ئاگەدار؛ هاگادار؛ چاودێر؛ چاوێر؛ چاڤدێر؛ وریا؛ نهێرتۆک؛ ڤچاڤ ‹مراقب بود کسی او را نبیند: ئاگادار بوو کەس نەیبینێ›.

**مراقبت** / morāqebat ، ـها/: [عربی]/اسم. چاوەدێری؛ چاودێری؛ چاوێری؛ کەتوانی؛ وێرداری؛ هەڤچاڤی؛ چاڤێری: ١. کەت؛ کەتوانە؛ کار و ڕەوتی هۆش پێوە بوونی کەس یان شتێک بە مەبەستی بەرگریکردن لە ون بوون، دزران یان گەزن دیتنی ٢. چاودێریکردن لە کەسێ بە هیوای نەخۆش نەکەوتن یان ساغ بوونەوەی ‹مراقبت از نوزاد: چاودێری لە کۆرپە›.

**مراقبه** / morāqebe ، ـها/: [عربی]/اسم. کار و ڕەوتی ڕاکێشان و کۆکردنەوەی هەموو بیر و هۆش لە سەر بابەتێکی دیاریکراو.

**مراکز** / marākez/: [عربی] جمعِ ☜ **مرکز**

**مرال** / marāl ، ـها؛ ـان/: [ترکی]/اسم. مەراڵ؛ جۆرێ کەڵەکێوی زلی ئێرانی کە هەر شاخێکی دوو شاخەکی درێژی لێ بۆتەوە، مێوینەکانیان بێشاخ و گچکەترن، بە کۆرپەیی خاڵدارن و دوای ساڵێک خاڵیان پێوە نامێنێ.

**مرام** / marām ، ـها/: [عربی]/اسم. مەبەست؛ دۆز؛ مەرام؛ هەنی؛ کاربەند؛ بەرگ: ١. بیر و بڕوا؛ ئامانج؛ شێواز و ناوەرۆکی بیروباوەڕی کەس یان تاقمێک ٢. کۆمەڵە بیر و بۆچوونێک، بە تایبەتی لەمەڕ ژیان، فەرهەنگ یان سیاسەتەوە ٣. مراد؛ مەبەست؛ داخواز.

▣ **با مرام**: *[گفتاری]* خۆشمرۆ؛ دڵاوەر.

**مرامنامه** / marāmnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. مەرامنامە؛ دۆزنامە؛ نووسراوەیێ کە حیزب، کۆمەڵە، ئەنجومەن یان تاقمێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی یان فەرهەنگی ئارمانجەکانی خۆیان لە دامەزران و چالاکی تێدا بڵاو دەکەنەوە.

**مرامی** / marāmî/: [عربی] صفت. مەرامی؛ دۆزی؛ سەر بە دۆز و مەرام ‹اختلافهای مرامی: جیاوازی مەرامی›.

**مراودات** / morāvedāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مراوده**

**مراوده** / morāvede ، ـها؛ مراودات/: [عربی]/اسم. ئامشۆ؛ ئاموشۆ؛ هاتوچۆ بۆ پێکەوە بوون (وەک دۆستی یان خزمایەتی) ‹با همسایەها هیچ مراوده ندارد: دەگەڵ دراوسێکاندا هیچ ئامشۆیەکی نیە›.

**مرایا** / marāyā/: [عربی]/اسم. ئەو شتانەی دەبیندرێن.

**مرئوس** / mar'ûs ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. ژێردەست؛ ژێردەس؛ چێردەس؛ بەردەست؛ کەسێ کە لە ژێر دەستی یەکێ‌تردا کار دەکا.

**مرئی** / mar'î ، ـها؛ مرئیات/: [عربی] صفت. دیار؛ ئاشکرا؛ بەرچاو؛ خویا؛ دیتەنی ‹بخش مرئی ماه: بەشی دیاری مانگ›.

**مرئیات** / mar'îyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مرئی**

**مربا** / morabbā ، ـها؛ ـجات/: [عربی]/اسم. مورەبا؛ مرەببا؛ لاچەژ؛ ڕیچار؛ ڕیچاڵ؛ ڕەچەڵ؛ میوەی (وەک سێو، بەی، قەیسی، تووڕک و...) لە شەکردا کوڵێندراوی خەستهەڵگەڕاو.

**مربع**[1] / morabba' ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. چارگۆش؛ چوارگۆش؛ چارگۆشە؛ چوارسووچ؛ چوارچمک؛ تەشکێکی تەختی هەندەسی بە چوارلاسکی یەکسان و دووبەدوو هاوشانەوە.

▣ مربع مستطیل ☜ **مستطیل**

**مربع**[2]: صفت. ١. چوارگۆش؛ چارگۆش؛

چوارگۆشە؛ چارگۆشە؛ بە بیچمی چوارگۆشەوە ‹حیاط مربع: حەوشەی چوارگوشە› ٢. لێکدراو ‹۴، مربع ۲ و ۱۶، مربع ۴ است: ٤، لێکدراوی ٢ و ١٦ دەبێتە لێکدراوی ٤›.

**مربوط** / marbût/: [عربی] *صفت*. ١. پێوەندی؛ پێوەندیدار؛ پەیوەندیدار؛ بە پێوەندی ‹این موضوع به تو هم مربوط است: ئەم باسە بە تۆشەوە پێوەندی هەیە› ٢. لکاو؛ بەسراو؛ بەستراو ‹راه‌آهن ایران از طریق عراق به سوریه مربوط می‌شود: ڕێئاسنی ئێران لە ڕێگای عێراقەوە لکاوە بە سوریەوە›.

**مربوطه** / marbûte/: [عربی] *صفت*. پێوەندیدار بە کەس یان بابەتی باسکراوەوە.

**مربی** / morabbî ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم*. ڕاهێن؛ ڕاهێنەر؛ فێرکەر؛ فێرکار؛ هەڤۆتکار: ١. پەروەرشیار؛ ئەوەی مرۆڤ یان گیانداریٚ ڕادێنیٚ یا فێری شتێکی دەکا ٢. ئەوەی لە نێو کاردا، شاگرد فێر دەکا ‹مربی خیاطی: ڕاهێنەری دروومان›.

**مرتاض** / mortāz ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم*. مورتاز؛ ئەوەی تالی و سوێری دەخاتە بەر خۆی تا دڵ و دەروونی بگەشێتەوە، بەتایبەت شوێنکەوتووانی ئایینی هیندوو.

**مرتب**[1] / morattab/: [عربی] *صفت*. مریٚس؛ تەکووز؛ پوخت؛ تەکویز؛ تەکوویس؛ ڕێکوپێک: ١. بە ڕیٚ و شوێن ‹به ترتیب حروف مرتب شده‌اند: بە پێی پیت مریٚس کراون› ٢. ڕازاوە؛ پۆڕ؛ بە سەر و بەر؛ مرێسدار ‹همه چیز مرتب است: هەموو شتیٚ ڕیکوپێکە›.

▣ مرتب کردن: ١. داچنین؛ هەڵوەژاردن؛ هەڵوەژارتن؛ ڕێزکردنی شت بە تەنیشت یەکەوە بە ڕێکوپێکی ٢. ڕازاندنەوە؛ جوان و لەبار کردن.

**مرتب**[2]: *قید. [گفتاری]* لە پەستا؛ لە پەسا؛ سەرەمڕ؛ هەیتا-هەیتا؛ یەکسەرە؛ بیٚوچان ‹مرتب می‌گفت برگردیم: لە پەستا دەیگوت بگەڕێنەوە›.

**مرتباً** / morattaban/: [عربی] *قید*. یەکسەرە؛ بیٚوچان؛ دایمە؛ لێکدا-لێکدا؛ لە پەسا؛ پەسای پەس؛ پەسا-پەسا ‹مرتبا گریه می‌کرد و فریاد می‌زد: یەکسەرە دەگریا و هاواری دەکرد›.

**مرتبط** / mortabet/: [عربی] *صفت*. بەسراو؛ بە پەیوەند؛ پەیوەندیدار؛ خاوەن پێوەندی ‹با بسیاری از کتابخانه‌ها مرتبط است: لەگەڵ زۆرێک لە کتێبخانەکاندا پێوەندی هەیە›.

**مرتبه** / martabe ، ـها/: [عربی] *اسم*. ١. /مراتب/ زیٚ؛ پایە؛ پلە؛ پلە و پایە ‹بلند مرتبە: پایە بەرز› ٢. جار؛ بار؛ هەل؛ ڕا؛ کەشە؛ کەڕەت؛ چەل ‹فقط چهار مرتبه او را دیده بودم: تەنیا چوار جار دیبووم›.

**مرتجع** / mortace' ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. دواوەگەڕ؛ کۆنەپەرست؛ کەللەکۆن؛ کەڤنەپەرست؛ پاشڤەرۆ؛ لایەنگری باوەڕ، بایەخ، داب و شێوەی ژیانی ڕابردووان، خوازیاری شوێن کەوتنیان و دژ بە نوێکاری.

**مرتجعانه** / mortace'āne/: [عربی/ فارسی] *قید*. کۆنەپەرستانە؛ دواوەگەڕانە؛ بە شێوەی کۆنەپەرستی.

**مرتد**[1] / mortad(d) ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم*. ١. وەرگەڕاو؛ پاشگەزی؛ هەڵگەڕاوە؛ هەڵگەڕاو؛ کەسیٚ کە لە بیر و باوەڕی کۆنی خۆ پەژیوان بۆتەوە و شوێنی ناکەویٚ ٢. *[اسلام]* مورتەد؛ موسوڵمانی لە دین دەرچووگ.

**مرتد**[2]: *صفت*. پاشگەزی؛ هەڵگەڕاوە؛ هەڵگەڕاو؛ لە دین دەرچووگ؛ پەژیوان لە بیر و باوەڕی خۆ ‹مسلمان مرتد؛ کمونیست مرتد: موسڵمانی وەرگەڕاو؛ کومونیستی هەڵگەڕاو›.

**مرتع** / marta' ، ـها؛ مراتع/: [عربی] *اسم*. جاڕ؛ ئالفجاڕ؛ لەوەڕگە؛ مەرگە؛ جیٚ لەوەڕ؛ لەوەڕگا؛ گیاجاڕ؛ چایەر؛ باسەڕە؛ گۆران؛ چائیرخانە؛ چیمەنگە؛ چیمەنزار؛ ڕەپەڵگا؛ زەوینی پڕ لە ئالفی جۆراوجۆری خۆڕسک کە ئاژەڵی تێدا

دەلەوەڕێنن.

◻ **مرتع اختصاصی/ انحصاری:** مەخـەڵ؛ پەلـەخ؛ پاوان؛ کۆدە؛ قۆرخ؛ لەوەڕ و مێرگی پاوان.

**مرتع تابستانی:** هاڤینەچەڕ؛ لەوەڕگەی پـووش و پار.

**مرتعـداری** / marta'dārî/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. چایـەرداری؛ کـار، ڕەوت یـان هونـەری شـین کـردن، بووژاندنــەوە و پاراســتنی لەوەڕگــە. هەروەها: **مرتعدار**

**مــرتعش** / morta'eš/: [عربـی] صـفت. لـەرۆک؛ لەرزۆک؛ لەرزک؛ لەرزەک؛ بە لەرە.

**مرتفـع** / mortafe', mortafa'/: [عربـی] صـفت. ١. بـەرز؛ بلـند؛ بلـیند؛ سـەماک ‹دشـت مرتفـع: دەشتی بەرز› ٢. لاچوو؛ لاچووگ؛ نـەماو؛ لابـراو ‹مشکل او مرتفع شد: گرفتەکەی لاچوو›.

**مرتکـب** / mortakeb، ـان؛ ـین/: [عربـی] صفت. تووش؛ تووشـیار؛ ئەنجامـدەری کـاری هەڵـە و ناشـیرین ‹مواظـب بـاش دیگـر مرتکـب ایـن گونـه اشتباهات نشوی! وریا بە چیـدی تووشـی هەڵـەی وا نەبێ!›.

**مرتهن** / mortahan/: [عربی]/اسم. [حقـوق] بارمتە؛ گرۆ؛ گرێو؛ ئەوەی لە گرێوی شتێکدایە.

**مــرتهن** / mortahen/: [عربـی]/اسـم. [حقــوق] بارمتەگر؛ ئەوەی گرێوی بەلاوەیە.

**مرتیکه** / martîke/ ☜ **مردیکه**

**مرثیـه** / marsîy(y)e، ـها؛ مراثی/: [عربـی]/اسـم. ١. دورک؛ شـەپۆڕنامە؛ شـین‌نامـە؛ هەڵبەسـتێ (بەتایبـەت بەنـد و بـاو) بـۆ لاواندنـەوەی مـردوو ٢. پرسە؛ ئازیەتی؛ شینگێڕی.

**مرثیەخوان** / marsîy(y)exān، ـها؛ ـان/: [عربـی/ فارسی]/اسم. شینگێڕ؛ ئەو کەسـە بـە بەنـد و بـاو مردوو دەلاوێنێتەوە. هەروەها: **مرثیەخوانی**

**مــرج** / marc/: [معـرب از کـردی]/اسـم. مێـرگ؛ مێرگە؛ مەرگە؛ شەکار؛ گیاجاڕ.

**مرجان** / marcān، ـها/: [سریانی]/اسم. مـەرجان: ١. گیانداری زەریایی کە لـە ئـاوی گەرمـدا بـە کۆمەڵ دەژی ٢. بسـتام؛ بـزگ؛ بـزک؛ کـۆڕال؛ پاشماوەی ڕەق هەڵاتووی ئەم گیانـدارە کـە لـە گەوهەرسـازی و سسلـە و پیلەسـازیدا کەلـکی لێوەردەگرن.

**مرجانی** / marcānî/: [سریانی] صفت. مـەرجانی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە مەرجان ٢. چێ‌کـراو لە مەرجان ٣. بە ڕەنگی نارنجی ئاماڵ سوور.

**مــرجح** / moraccah/: [عربـی] صـفت. [ادبـی] ١. هەڵبژاردە؛ لەسەر؛ وەبەر ‹آرام بـر همـه مـرجح است: ئارام بە سەر هەمووانداا هەڵبژاردەیە› ٢. چاتر؛ چاکتر؛ باشتر؛ خاستر؛ خاستەر ‹فردا مرجح است: بەیانی چاکترە›.

**مرجـــع** / marca'، ـهـا؛ مراجـع/: [عربـی]/اسـم. ١. سەرچاوە؛ ژێدەر؛ کەس یان نووسراوەیێ کـە بــۆ وەرگــرتنی زانیاریــەکی تایبــەت ســەری لــێدەدەن ٢. ســەرچاوە؛ ژێـدەر؛ کتێـب یــان نوسراوەیێ کە هەموو جـۆرە زانیـاری تێـدا کـۆ کراوەتەوە و هەر کـەس بـە پیـێ نیـازی خـۆی چاوی لێدەکا (وەک پێرسـتی کتێبـان، ساڵـنامە، وشــەدان، فەرهــەنگی بــەرفراوان و ...): **رفــرانس** ٣. نیشـانە، شـت یـان شـوێنێ کـە گۆڕانکـاری ڕەوتێکی لەگەڵـدا هەڵدەسـەنگێنن ٤. [دستور] وشەیەک کە جێناو دەچێتەوە سەری.

◻ **مرجع اطلاعاتی:** چاوگ/ سەرچاوەی زانیاری؛ سەرچاوەیەک بۆ زانیاری وەرگرتن.

**مرجعیت** / marca'îyyat/: [عربی]/اسم. چـاوگی؛ ژێــدەری؛ ســەرچاوەیی؛ دۆخ یــان چۆنیــەتی سەرچاوە بوون.

**مرجمک** / marcomak/: ☜ **عدس**

**مرجــوع** / marcû'/: [عربـی] صـفت. هەڵـگەڕاوە؛ هەلەوگەڕیاگ.

◻ **مرجــوع شــدن:** ناردرانــەوە؛ هەناریانــەوە؛ نێردرانــەوە؛ هەڵـەوگەڕیانەوە ‹کتـابهـایی کـە فرســتادە بودیـد، مرجــوع شـد: ئـەو کتێبانــەی

ناردبووتان، ناردرانەوە›.

مرجوع کردن: ناردنەوە؛ هەڵگەڕاندنەوە؛ گەڕاندنەوە؛ کیاستەیوە؛ ناردنەوە؛ هەناردنەوە؛ وەرگەڕاندنەوە ‹چرا کتاب‌ها را مرجوع کردید؟: بۆ کتێبەکانتان ناردەوە؟›.

**مرجوعی** / marcû'î ، ـها/: [عربی] صفت. [گفتاری] هەڵگەڕاوە؛ گەڕاوە؛ هەڵگەڕێنراو؛ هەڵەوگەڕیاگ ‹نامەی مرجوعی: نامەی هەڵگەڕاوە›.

**مرحبا** / marhabā/: [عربی] دعا. ئافەرین؛ ئافەرەم ‹مرحبا به صداقتت: ئافەرین بۆ ڕاستبێژیت›.

**مرحله** / marhale ، ـها؛ مراحل/: [عربی]/اسم. قۆناغ؛ قۆناخ؛ پلە: ١. پلە و قولە؛ هەر کام لە زنجیرە جێگا یان وێستگەگەلی یەک لە دووی یەک ‹مرحلەی اول کنکور: قوناغی یەکەمی کونکوور› ٢. مەودای نێوان ئەو وێستگە و جێگانە ‹هر مرحله چهار ترم است: هەر قوناغێک چوار ترمە› ٣. دەور؛ دەوران؛ دەوری پێشڕەوت، چالاکی یان گووران ‹مرحلەی شکوفایی: قوناغی گەشە›.

▣ از مرحله پرت بودن: [مجازی] خەبەر/ ها لە هیچ نەبوون؛ بێ خەوەر و نائاگا بوون ‹فهمیدم که مدیر از مرحله پرت است و چیزی نمی‌داند: زانیم کە بەڕێوەبەر های لە هیچ نیە و شتێ نازانێ›.

**مرحله‌ای** / marhale'î/: [عربی] صفت. قۆناغی؛ قۆناخی؛ پێوەندیدار یان سەر بە قۆناغ ‹آزمون دومرحله‌ای: ئەزموونی دووقۆناخی›.

**مرحمت** / marhamat ، ـها؛ مراحم/: [عربی]/اسم. دلۆڤانی؛ میهرەوانی؛ بە بەزەیەتی.

▣ مرحمت زیاد: سایەت کەم نەبێ؛ خوا لێمانت نەسێنێ؛ دەستەواژەیەکە کاتی خواحافیزی بە نیشانەی سپاس دەگوترێ، واتە چاکە و خێرخوازیت هەر ڕوو لە زۆر بوون بێ.

▣ مرحمت داشتن: دلۆڤان/ میهرەبان بوون ‹او به من مرحمت داشت: لەگەڵ من میهرەبان بوو›.

مرحمت کردن: ١. گەورەیی کردن؛ دلۆڤانی کردن؛ میهرەبانی‌کردن ‹خیلی مرحمت کردید تشریف آوردید: گەورەییتان کرد تەشریفتان هێنا› ٢. خەڵات دان/ کردن؛ پێشکەش‌کردن ‹این کیف را مدیر به ایشان مرحمت کردند: بەڕێوەبەر ئەم کیفەی پێ خەڵات کرد›.

**مرحمتی** / marhamatî ، ـها/: [عربی] صفت. پێشکەشی؛ خەڵاتی؛ خەڵات‌کراو؛ پێشکەش‌کراو ‹کتاب مرحمتی دریافت شد: کتێبی پێشکەشی وەرگیرا›.

**مرحوم** / marhûm ، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. ١. خوا لێ‌خۆش‌بوو؛ خواعافووکردوو؛ ڕەحمەتی؛ ڕۆح شاد (بۆ مردووی دەڵێن) ‹مرحوم پدرم این‌جا را خریده بود: باوکی خوا لێ‌خۆش‌بووم ئێرەی کڕیبوو› ٢. بە ڕەحمەت چوو؛ کۆچ‌کردوو؛ مردوو؛ مردگ ‹پدرش دیروز مرحوم شد: بابی دوێنێ بە ڕەحمەت چوو›.

**مرخص** / morax(x)as/: [عربی] صفت. مەرەخەس؛ بەردایی: ١. ڕزگار؛ ڕەها؛ بەر؛ ڤەرستی؛ خەلاس؛ دەرهاتوو لە شوێنێ کە بە زۆر یان ناچاری تێیدا بووە ‹سارا دیروز از بیمارستان مرخص شد: سارا دوێنێ لە نەخۆشخانە ڕزگار بوو› ٢. [قدیمی] بەرایی‌دراو؛ بەرایی‌پێ‌دراو؛ ڕێگەدراو بۆ کارێ ‹مرخص است برود: مەرەخەسە، دەتوانێ بچێ› ٣. [گفتاری] لاکەوتە؛ بەکارنەهاتوو؛ لەکارکەوتوو ‹این ماشین دیگر مرخص است: ئەم ماشینە چیتر لاکەوتەیە›.

**مرخصی** / morax(x)asî ، ـها/: [عربی]/اسم. بەردایی؛ بەرایی؛ ڕێدایی؛ مەرەخەسی: ١. دۆخ و چۆناوچۆنی بەر بوون ‹در مرخصی بود: لە بەردابیدا بوو› ٢. ڕزگاری لە شوێنی دانیشتنی بە زۆر و زەبر ‹مرخصی از زندان: بەردایی لە بەندیخانە› ٣. بەرایی بۆ جێ‌هێشتنی شوێنی کار بۆ ماوەیەکی دیاریکراو ‹یک ساعت از اداره مرخصی گرفتم: سەعاتێک لە مەزرینگە بەراییم وەرگرت› ٤. مافی کارمەند یان کرێکار لە سالێکدا بۆ حەسانەوە و جێ هێشتنی شوێنی کار ‹کارگران

یک ماه مرخصی سالانه دارند: کرێکاران یەک مانگ بەردایی سالانەیان هەیە›.

**مرخم**[1] / moraxxam ، ـها/: [عربی]/اسم. [دستور] لێکەوت؛ وشەیێ کە پیت یا پیتەکانی ئاخری داکەوتبێ (وەک «خور و خواب» کە لە بنەڕەتدا «خوردن و خوابیدن» بووە. تێبینی: ئەم پێکهاتە لە کوردیشدا هەیە، وەک «هات و چوو» کە لێکەوتی «هاتن و چوون»ە).

**مرخم**[2]: صفت. کورتە؛ کورتکراو؛ کورتکراوە؛ کورتەوەکراو.

**مرد** / mard ، ـها؛ ـان/: اسم. پیاو؛ پیاگ؛ پیا؛ مێر؛ پا: ۱. مۆردەم؛ نێری بنیادەم؛ مرۆڤی نێرینەی پێگەیشتوو ۲. شوو؛ مێرد؛ مێرو؛ مێردە؛ هاوسەری ژن ۳. نێر؛ مرۆڤی نێرینە (کوڕ یان پیاو، لە سەرژمێری یان دیاری کردنی ڕەگەزدا) ٤. مەرد؛ مەردەمێر؛ جوامێر؛ ئەوەی خوو و خدەی بەرزە ‹مردی پیدا می‌شد و حقش را کف دستش می‌گذاشت: پیاوێک هەلدەستا و حەقی دەنایە مشتی› ٥. مەرد؛ کەسێ کە توانست و لێهاتوویی جێبەجێ‌کردنی کارێکی هەبێ ‹مرد عمل: پیاوی کار› ٦. [گفتاری] لێهاتوو لە باری جنسیوە.

◘ **مرد آهنین**: [مجازی] پیاوی پۆلایین؛ کەسی کۆڵنەدەر و پێچەقێن و تێکۆشەر.

**مرد جنگ**: شەڕڤان؛ جەنگاوەر؛ پیاوی شەڕ؛ کوڕی شەڕ.

**مرد خانه**: پیاوی ماڵ؛ پیاگ ماڵ؛ کەسێکی نێرینە کە سەرپەرشت یان نانهێنەری بنەماڵەیە.

**مرد خدا**: خواناس؛ پیاوی خودا؛ پیاگی خوا؛ مەرد خوا؛ پیاخاسوو خوای؛ بڕوامەند بە خودا.

**مرد رند** ☜ **مردرند**

**مرد زن‌نما**: سەرژنانە؛ ئاغەباجی؛ ژنانیلە؛ سەرژنانیلە؛ بلەکناچێ؛ ژنانی؛ کچانی؛ کناچلە ڕەنگ؛ پیاوێ کە لە خوو و خدەدا لاسایی ژن دەکاتەوە.

**مرد عمل**: [مجازی] پیاوی کار؛ پیاو کاری؛ کوڕی کار: ۱. ئەو کەسەی بیرۆکەکانی دەهێنێتە دی ۲. کەسێکی تێکۆشەر و لێهاتوو: **مرد کار**

**مرد قورباغه‌ای**: مەلەوانی بن گۆم بە ماسک، کەوشی سەوڵی و خەزێنەی هەواوە کە بۆ ماوەیەک لە ژێر ئاودا بمێنێتەوە.

**مرد کار** ☜ **مرد عمل ـ۲**

**مرد میدان**: [مجازی] کوڕی مەیان/ کوڕ؛ ئەو کەسەی بۆ تێهەڵچوون و بەربەرەکانێ ئامادەیە.

◘ **مرد چیزی بودن**: [مجازی] کوڕی شتێ بوون؛ لێهاتوو بۆ تێهەڵچوون و جێبەجێ‌کردنی کارێک ‹مرد این کار هستی؟: کوری ئەم کارە هەی؟›.

**مرد شدن**: بوونە پیاو: ۱. پێ‌گەیشتن؛ گەورە بوون ۲. بوونە خاوەن ژن و منداڵ ۳. بوونە خاوەن پلە و پایە.

**مرداب** / mordāb ، ـها/: اسم. گەبەڵ؛ تالاو؛ زەلکاو؛ زەلکۆ؛ مردواو؛ مرداو؛ قۆپی؛ قۆپیە؛ مەرازە؛ بوغاز؛ چراڤ؛ گۆلەئاوێکی مەند و پەل کە لە زێبارێک جوێ بۆتەوە یان لە یەک‌گرتنەوەی چەند چۆم بەدی هاتووە.

**مردابی** / mordābî/: صفت. زەلکاوی؛ تالاوی؛ گەنداوی؛ گەبەڵی: ۱. سەر بە زەلکاو ‹گیاه مردابی: گیای زەلکاوی› ۲. بە زەلکاوەوە ‹منطقه‌ی مردابی: ناوچەی زەلکاوی›.

**مرداد** / mordād/: اسم. گەلاوێژ؛ مورداد؛ مانگی پێنجمی ساڵ؛ نێوەڕاست مانگی هاوین: **اَمُرداد**

**مردار** / mordār ، ـها/: اسم. مردار؛ مرار؛ مرداڵ؛ لەرگ: (الف) مردارەوەبوو؛ مردارەوبووگ؛ مرداڵەوو؛ مندار؛ گیانەوەری گۆشت‌حەلال کە خۆی مردبێ یان بە شەرعی سەری نەبڕابێ ب) تۆپیو؛ تۆپا؛ تۆپیگ؛ تەنبوو؛ کەوتی؛ سەقەت؛

سەکەت؛ سەکت؛ مەردا؛ لاشەی گیانەوەری حەرامگۆشت.

▣ مردار شدن: *الف)* مردارەوە بوون؛ مندار بوونەوە؛ مردار بوون؛ مرار بین؛ گیان دەرچوونی حەیوان بەبێ سەربڕین *ب)* فەتین؛ تۆپین؛ تۆپەی؛ تۆپای؛ سەکتین؛ شیاین؛ تۆپەڕا بوون؛ هەڵتۆپین؛ هەڵتلۆپین؛ هەڵتلۆپیان؛ تۆپان؛ سەکەت بوون؛ کەوتین؛ گیان دەرچوونی حەیوانێ کە گۆشتی ناخورێ.

مردار کردن: *الف)* مردارکردنەوە؛ مرداركردن؛ مردارەوکردن؛ مراندنی حەیوان بێ سەربڕین *ب)* تۆپانن؛ تۆپاندن؛ سەکەتکردن؛ کەوتاندن؛ کوشتنی حەیوانی حەرامگۆشت.

**مردارخوار** / mordārxār ، ـان/: *صفت.* لاشەخۆر؛ لاشخۆر؛ مرارخۆر؛ مردارەخۆر؛ هۆکارە و چەشتەی گۆشتی مردارەوەبوو.

**مردارسنگ** / mordārsang/: *اسم. [شیمی]* مەرداسەنگ؛ ئوکسیدی زەردی سرپ کە بۆ دروستکردنی ڕەنگ و شیشە و لاستیک بەکار دێ.

**مردافکن** / mardafkan/: *صفت. [مجازی]* پیاوبەزێن؛ بلەربەزێن؛ زۆر بە هێز و گورد.

**مردانگی** / mardānegî ، ـها/: *اسم.* پیاوەتی؛ پیاگەتی؛ پیاگەری؛ پیاداری؛ مرۆڤایەتی؛ جامێری؛ چکی؛ مەردازایی؛ مەردومی؛ قەنجانی؛ جوامێری؛ مێراتی؛ مەردی؛ مەردایەتی؛ مێرینی؛ مێریتی: ١. غیرەت؛ دۆخ یان چۆنیەتی دارا بوونی تایبەتمەندیگەلی پیاوانە ٢. مێرخاسی؛ چاکە؛ دۆخ یان چۆنیەتی دارا بوونی تایبەتمەندیگەلی چاک.

**مردانە**[1] / mardāne/: *صفت.* پیاوانە؛ مێرانە؛ مێردانە؛ پیایانە؛ پیاگانە: ١. /ـها/ پێوەندیدار یان سەر بە پیاوان ‹کفش مردانە: پێڵاوی پیاوانە› ٢. کوڕانە؛ مێرەکی؛ ئازایانە؛ مەردانە؛ چالاکانە؛ وەکوو پیاوان ‹قامت مردانە: بەژنی پیاوانە›.

**مردانە**[2]: *قید.* پیاوانە؛ پیاگانە؛ مێرانە؛ کوڕانە؛ پیایانە؛ بە ڕەوشتی پیاوان ‹او همە چیز را مردانە تحمل کرد: ئەو پیاوانە لەگەڵ هەموو شتێکدا هەڵیکرد›.

**مردانەدوز** / mardānedûz ، ـها؛ ـان/: *اسم.* پیاوانەدوور؛ ئەوی گنج یان پێلاوی پیاوانە دەدوورێ.

**مردد** / moraddad ، ـها؛ ـین/: [عربی] *صفت.* پاوپا؛ دوودڵ؛ دڕدۆنگ؛ دووشک ‹مدتی مردد بودم کە بروم یا نروم: ماوەیێ دوودڵ بووم بچم یا نەچم›.

هەروەها: **مردد بودن؛ مردد شدن؛ مردد ماندن**

**مردرند** / mard(e)rend/: *صفت. [مجازی]* زۆڵ؛ فورتەک؛ ژخوڤەژیرە؛ سەگفزوول؛ زیت و فێلباز.

**مردرندی** / mard(e)rendî ، ـها/: *اسم.* زۆڵی؛ فێلەبازی؛ دۆخ یان چۆنیەتی زیت و فێلباز بوون.

**مردسالاری** / mardsālārî/: *اسم. [جامعەشناسی]* پیاوسالاری؛ پیاومەزنی؛ جۆرێ ڕژیمی کۆمەلایەتی کە دەسەلات لە دەستی پیاودایە.

**مردستیزی** / mardsetîzî ، ـها/: *اسم.* دژەپیاوی؛ پیاوسواژی؛ دوژمنی دەگەڵ پیاوان و دان نەنان بە ژێهاتوویی و شیاوییاندا. هەورەها: **مردستیز**

**مردک** / mardak/: *اسم.* خوێرپلە؛ پیاویژگە؛ مێردەک؛ مێرک: ١. *[نامتداول]* گونەڵ؛ پیاوی کورتەبالا ٢. *[تعریض]* زەلامۆک؛ بۆرەپیاگ؛ خوێری و کەم بایەخ لە باری کۆمەلایەتی و ڕامیاریەوە.

**مردم** / mardom ، ـان/: *اسم.* خەڵک؛ عالەم؛ خەڵق؛ مرۆڤان: ١. مەردم ‹همەی مردم در برابر قانون با هم برابرند: هەموو خەڵک لە هەمبەر قانوونەوە وەکوو یەکن› ٢. ئاپۆرە؛ تاقمێکی دیارینەکراو لە مرۆڤ کە بە هۆی بڕێ تایبەتمەندیەوە دەچنە پاڵ یەک ‹مردم تهیدست:

خەڵکی هەژار› ٣. حەشامات؛ حەشیمەت؛ خەڵکی ئاسایی لە چاو تاقم یان چینێکی دیاریکراو ‹مردم و دولت: خەڵک و دەوڵەت› ٤. ئاپۆرەی نیشتەجێ لە شوێنێک ‹مردم ژاپن: خەڵکی ژاپون› ٥. *[گفتاری]* دیتران؛ نامۆیان؛ خەڵکی غەوارە ‹به مردم چه ربطی دارد؟: چی بە سەر دیترانەوەیە؟›.

▣ **مردم کوچه و بازار:** خەڵکی کووچە و کۆڵان؛ خەڵکی ڕەمەکی؛ خەڵکی ئاسایی کە کار یان بار و دۆخێکی کۆمەڵایەتی بەرچاویان نیە ‹روشنفکری که حرف مردم کوچه و بازار را نفهمد برای لای جرز خوب است: ڕۆشنبیرێ کە لە قسەی خەڵکی کووچە و کۆلان تێنەگا بۆ شێف برین باشە›.

**مردمآزار** / mardomāzār ، ـها/: *صفت.* مەردمئازار؛ خەڵکوەزەن؛ بێخەیر؛ دڵچڕ؛ بەدفەڕ؛ تەڕن؛ هۆگر و هۆکارە بە ئازار دانی خەڵک. هەروەها: **مردمآزاری**

**مردم آمیز** / mardomāmîz/: *صفت.* خۆڕێخەر؛ لێهاتوو لە خۆ ڕێکخستن دەگەڵ خەڵکدا. هەروەها: **مردمآمیزی**

**مردمپسند** / mardompasand/: *صفت.* خەڵکپەسەن؛ بە دڵی خەڵک؛ پەسەن و جێ سەرنجی کۆمای خەڵکی ئاسایی (نە چینی هەڵبژاردەی گەل).

**مردمدار** / mardomdār/: *صفت.* مەردمدار؛ لێهاتوو و هۆگری هەڵکردن و سازان دەگەڵ خەڵکدا.

**مردمداری** / mardomdārî ، ـها/:*اسم.* مەردمداری؛ کاری هەڵکردن و بۆ لای خۆ ڕاکێشانی خەڵک.

**مردمدوست** / mardomdûst ، ـها؛ ـان/: *صفت.* گەلپەرست؛ گەلدۆس؛ گەلحەز؛ مەردمدۆس؛ مرۆدۆست؛ مەردمدۆست؛ خەڵکدۆست؛ خۆشویستی خەڵک و هۆگری یارمەتی دانیان.

هەروەها: **مردمدوستی**

**مردمسالاری** / mardomsālārî/:*اسم.* خەڵکسالاری؛ خەڵکمەزنی؛ مرۆسالاری؛ دیموکراسی؛ ڕژیمێ کە خەڵک لە دامەزران و بەڕێوە چوونیدا، دەستی بالای هەیە.

**مردمستیز** / mardomsetîz ، ـها؛ ـان/: *صفت.* نەگریس؛ لاسار؛ دژ بە خەڵک؛ بە خوو و خدەی دژایەتی و نەسازان لەگەڵ خەڵکدا. هەروەها: **مردمستیزی**

**مردم سنجی** / mardomsancî/:*اسم.* زانست و شێوەکاری پێوان و لە گەزدانی لەشی مرۆڤ لە باری ئەندازە و ڕادەی لەباری و ڕێکیەوە.

**مردمشناسی** / mardomšenāsî/:*اسم.* خەڵکناسی؛ مەردمناسی؛ لقێ لە زانستی مرۆڤناسی کە لە ڕەچەڵەک، پێوەندی ئاقاری و کۆمەڵایەتی، زمان و فەرهەنگی کۆمەڵگای مرۆ دەکۆڵێتەوە. هەروەها: **مردمشناس**

**مردمفریب** / mardomfarîb ، ـها؛ ـان/: *صفت.* خەڵکخلەتێن؛ مەردمخەڵەتێن؛ خەڵەتێنەری خەڵک. هەروەها: **مردمفریبی**

**مردمک** / mardomak ، ـها/:*اسم.* بیبیلە؛ بیلبیلە؛ بەبەڵە؛ بیبکە؛ بیبیک؛ بیبۆک؛ بیبک؛ پێبک؛ پیبۆک؛ گلێنە؛ گلێنیە؛ گلێلک؛ کێلکی؛ گلار؛ گلارە؛ گدارە؛ گادانە؛ کێچک؛ کچێنە؛ کچینە؛ کەچاچاڤ؛ کەچکاچاڤ؛ کەشکاچاڤ؛ بیبی؛ بیقل؛ ڕەهن؛ ڕەهنک؛ کوڕژا؛ گوللی؛ ڕەشێنە؛ ڕەشرِشک؛ ڕەشرِەشک؛ ڕەشک؛ ڕەشکە؛ کۆڤان؛ کونکاچاڤ؛ کەنیشکی؛ گوورزەکاچاڤ؛ کناچلۆ چەمی؛ ڕەشێنکەی چاو؛ ڕۆچنەیەک لە توێی چاودا کە تیشکی لێوە تێپەڕ دەبێ و بە کەم و زۆری تیشک، گەورە و بچووک دەبێتەوە.

**مردمگرا** / mardomgerā ، ـها؛ ـیان/: *صفت.* خەڵکواز؛ مەردمی؛ هۆگر و خوازیاری هاوڕێیی کردن و یارمەتی دانی خەڵک. هەروەها:

مردمگرایی
**مردمگریز** / mardomgorîz ، ـها؛ ـان/: *صفت*. دوورەپەرێز؛ کنارێن؛ لاتەریک؛ بێواز لە ناو خەڵک و خۆ دە کونج خزێن. هەروەها: **مردمگریزی**
**مردمی**[1] / mardomî ، ـها/: *اسم*. مەردمی؛ مرۆڤایەتی؛ مرۆگی؛ مرۆڤانی؛ قەنجانی؛ جوامێری؛ مێرانی؛ ڕندی؛ پیاوچاکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هەبوونی ئاکار و کردەوەی لەبار و شیاوی مرۆڤ.
**مردمی**[2]: *صفت*. مەردمی: ۱. مرۆڤی؛ سەبارەت بە خەڵک ۲. پێوەندیدار یان تەبا دەگەڵ قازانج، زەووق یان خواستی خەڵکدا ‹دولت مردمی: دەوڵەتی مەردمی›.
**مردمیاری** / mardomyārî/: *اسم*. مرۆڤانی؛ کار یان ڕەوتی یاری دانی خەڵک و کردنی کاری بەقازانج بۆ کۆمەڵگا.
**مردن** / mordan/: *مصدر. لازم.* // **مردی**: مردی؛ **می میری**: دەمری؛ **بمیر**: بمرە// مردن؛ مرن؛ مەردەی؛ ماردش؛ مەردش: ۱. گیان دان؛ هەڵپلۆسکان؛ هەڵپلۆسکیان؛ گیان کەندن؛ چاو سپی بوون؛ گاندایش؛ گان ڤەتش؛ هاتنە لا؛ دوایی هاتنی ژین؛ گیان لە لەشدا نەمان ۲. *[مجازی، ادبی]* کوژانەوە؛ داکوژان؛ وەکوژان؛ دامران؛ دامرکان؛ داتەمران؛ داتەمریان؛ ئەوەکوشیەی؛ مەردەیرە؛ خامۆش بوون ‹مردن چراغ: کوژانەوەی چرا› ۳. *[مجازی]* بڕان؛ نەمان؛ نەمەنەی؛ کوژانەوە؛ لە ناو چوون بەتایبەت لە بواری هزر و هەستەوە ‹مردن امید: هیوا بڕان› ٤. *[مجازی]* فەوتان؛ تێدا چوون؛ تیاچوون؛ تووشی سەخڵەتی و دژواری ئەستەم هاتن ‹از تشنگی مردن: لە تینوویەتیدا مردن› (بە مانای یەکجار تینوو بوون) ٥. *[مجازی]* زۆر خۆش ویستنی کەس یان شتێ ‹برای کسی مردن: مردن بۆ کەسێ› ٦. *[تعریض]* گوم و گۆڕ بوون؛ زۆر پێچوون و نەهاتنەوە ‹این زن هم که رفت و مُرد: ئەم ژنەش خۆ ڕۆی و گوم و گۆڕ بوو›.
■ صفت مفعولی: **مرده** (مردوو)/ مصدر منفی: **نَمردن** (نەمردن)
**مردنگی** / mardangî ، ـها/: [از سنسکریت] *اسم*. *[قدیمی]* لاله؛ لالا؛ لەعلە؛ جۆرێ شووشە چرای گەورەی زارئاوەڵا (دەمباز) کە لە سەر شەم یان چرا دایاندەنا، با نەیکوژێنێتەوە.
**مردنمایی** / mardnemāyî/: *اسم*. نێرەکوڕکەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی وەک پیاو هاتنە بەر چاو یان خۆ وەک پیاو لێ کردن (بۆ ژن).
**مردنی** / mordanî/: *صفت*. ۱. لەمردن؛ لەنەمان؛ مردنی؛ بمر؛ مەردەکی؛ بە ئەگەر یان چەلانی مردن ‹بی‌خود نترس! این آدم به این زودی‌ها مردنی نیست: لە خۆڕا مەترسە! ئەمە بێت و بەم زووانە لەمردن نیە› ۲. ـ*ـها/[مجازی]* دالگۆشت؛ قاڕووعەم؛ قاڕقاڕۆک؛ قارووچ؛ قارپچۆک؛ قاریت؛ قرخن؛ کۆپڵ؛ گەڕک؛ گەڕکە؛ مردوولە؛ مەڕەمووکە؛ مردۆخە؛ مردۆخ؛ مردڵ؛ مرداڵ؛ فیق؛ فێقن؛ جیقنە؛ جیقن؛ جیقە؛ چەرمە؛ جووقن؛ لەڕ و لاوازی کەلەلا کە بەحاڵ نووزەی دێ ‹این مرغ مردنی را چرا خریدی؟: ئەم مریشکە دالگۆشتەت بۆ کڕیوە؟› ۳. بۆ مردن؛ مەوچنەک؛ شیاو یان لایقی مردن.
**مردود** / mardûd ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. ڕەد؛ ڕفووزە؛ وەرنەگیراو؛ لە ئەزموون دەرنەچوو (بەتایبەت لە تاقی کردنەوەدا) ‹آرام مردود شده و باید سال دیگر هم بخواند: ئارام ڕەد بووە و دەبێ ساڵێکی دیش بخوێنێ›.
**مردوده** / mardûde/: [عربی] *صفت*. دۆخی ژنێک کە تەڵاق دراوە و گەڕاوەتە ماڵی بابی.
**مرد و مردانه** / mard-o-mardāne/: *قید*. پیاوانە؛ پیاگانە؛ مەرد و مەردانە؛ کوڕی کوڕانە؛ بە بوێری و چاو نەترسی و جوامێریەوە ‹در برابر دشمن مرد و مردانه مقاومت کرد: لە بەرامبەر دوژمنەوە پیاوانە

ڕاوەستا›.

**مرده** / morde ، ـها؛ ـگان/: *صفت*. مردوو؛ مەردە؛ مردگ: ١. ژین لێبڕاو؛ گیان تێدا نەماو؛ گیان دەرچووگ؛ مەردا؛ مردی؛ ماردا؛ مارده ‹پرندەی مرده: مەلی مردوو› ٢. *[مجازی، ادبی]* کوژراوە؛ داکوژاو؛ وەکوژاو؛ ئەرەکوشیا؛ ئەرەمەردە؛ تەمراو؛ داتەمراو؛ دامرکاو؛ خامۆش‌بووگ ‹آتش مرده: ئاگری کوژراوە› ٣. *[کنایی]* لە بنە هاتوو؛ لە کیس چووگ ‹عشق مرده: ئەوینی مردە› ٤. *[مجازی]* شەل‌وپەت؛ شەکەت و هەڵەکەت؛ بێهاز ‹خسته و مرده به خانه برگشتم: شەکەت و مردوو هاتمەوە بۆ ماڵ› ٥. *[مجازی]* دڵ‌نەماو؛ هیلاک ‹او مردەی آن دختر بود: مردووی ئەو کچە بوو› ٦. لەبیرەوەچوو؛ نەماو ‹زبانهای مُرده: زمانگەلی مردوو› ٧. مات؛ بێبریقە (بۆ ڕەنگ) ‹رنگ مرده: ڕەنگی مات›.

**مرده‌باد** / mordebād/: *دعا*. بمرێ؛ بکەوێ؛ نەمێنێ؛ داوای لە ناو چوونی شتێک یان کەسێ ‹مرده باد استبداد: بمرێ زۆرەملێ›.

**مرده‌پرستی** / mordeparastî/: *اسم*. مردووپەرستی؛ مردەپەرستی؛ مەردەپرێسی؛ ڕێزنانی لەڕادەبەدەر لە مردووان و ڕابردووان و شانازی پێکردنیان. هەروەها: **مرده‌پرست**

**مرده‌خور** / mordexor ، ـها/: *صفت*. بەرخۆر؛ زگ‌لەوەڕێن؛ خۆ بە خەڵک تێرکەر؛ هۆکارە و هۆگری کەڵک وەرگرتن و قازانج بردن لە مەرگی خەڵک. هەروەها: **مرده‌خوری**

**مرده‌ریگ** / morderîg/: *اسم*. *[ادبی]* میرات؛ میراتی؛ پاشماوە؛ جێماوە؛ ئەوەی لە مردوو بەجێ ماوە.

**مرده‌زاد** / mordezād/: *اسم*. لەبەرچوو/ چووگ؛ زارۆیێ کە بەر لە هاتنە دنیا یان لە کاتی هاتنەدنیادا بمرێ.

**مرده‌سگ** / mordesag/: *صفت*. سەگ‌تۆپیو؛ سەگ‌تۆپی؛ جنێوێکە واتا وەک سەگی تۆپیو پیس و پۆخڵ.

**مرده‌شو** / mordešû ، ـها/: *اسم*. مریشۆر؛ مردگ‌شۆر؛ مردووشۆر؛ مردیشۆر؛ مەردەشۆر؛ کەسێ کە مردووەکە پێش کفن‌کردن دەشۆرێ.

▣ **مرده‌شو بردن**: بە مەردەڵای شەڕ چوون؛ دوابڕان (بۆ جنێو یان نفرین) ‹مرده‌شو ببرد آن نانی را که تو می‌خوری؛ مرده شو ببرد این شوهر را: بە مەردەڵای شەڕ بچێ ئەو نانەی تۆ دەیخۆی؛ دوای ببڕێ ئەم شووە›.

**مرده‌شوخانه** / mordešûxāne ، ـها/: *اسم*. مەردەشۆرخانە؛ شوێنی مردوو لێ شوردن.

**مرده‌کشی** / mordekešî ، ـها/: *اسم*. *[تعریض]* کار و ڕەوتی هەڵگرتن و بردنی مردوو بۆ سەر قەبران.

**مردی** / mardî/: *اسم*. مێردی؛ مێرێنی؛ پیاوەتی؛ پیاوی؛ پیاگی: ١. پیاگەری؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی پیاو بوون ‹از مردی همین صدای کلفت را داری؟: لە پیاوەتی هەر ئەم نەڕەتە هەیە؟› ٢. *[مجازی]* جوامێری؛ مێرخاسی؛ مێریتی.

▣ **از مردی افتادن**: لە پیاوەتی کەوتن؛ مێرینی نەمان؛ لە دەست دانی قەوەتی گان‌کردن.

**مردیکه** / mardîke/: *اسم*. *[گفتاری]* هەتیوە؛ پیاویژگە ‹مردیکه جُلنُبر چه ادعاها دارد!: هەتیوە شڕ و شەپڕێوە چ شات‌وشووتێ دەکا!›: **مرتیکه**

**مرز** / marz ، ـها/: *اسم*. سنوور؛ سینۆر؛ کەوشەن؛ حدوود؛ دەروەچار؛ سەرحەد؛ مەرز؛ توخوب؛ تخوب؛ کەرخ؛ تاڵخ؛ تخوم؛ پەڕ؛ حەد؛ هەد؛ سەرخەت؛ هۆم: ١. جەسپەر؛ شوورە؛ بەنگ؛ بەلک؛ چیلە؛ درسەگ؛ قەمتەرە؛ تیزمالکەزەوین یان لەمپەری سروشتی (وەک کەژ و چەم) کە پانتای ژێردەسەڵاتی دوو وڵاتی هاوسێ دیاری دەکا ‹مرز ایران و پاکستان: سنووری ئێران و پاکستان› ٢. ناوچەی پەنا سنوور ‹مدتی در مرز زندگی می‌کرد: ماوەیێ لە سنووردا دەژیا› ٣. بڕ؛ بەشی دەرەکی یا قەراخی ئاقارێ ‹مرز چراگاه: کەوشەنی لەوەڕگە› ٤. ئەوەی ڕادە یان بەری

شتێ دەسنیشان دەکا ‹جمعیت زمین از مرز شش میلیارد گذشت: جەماوەری زەوی لە مەرزی شەش ملیار تێپەڕی کرد› ٥. *[ادبی]* هەرێم؛ ولات؛ ئاقار؛ ناوان ‹مرزهای دانش: کەوشەنی زانست›.

▣ **مرز طبیعی:** سنووری سروشتی؛ لەمپەری سروشتی (وەک کێو و زەریا) کە مەرزی نێوان دوو ولاتە.

**مرزبان** / marzbān ، ـها؛ ـان/: *اسم.* مەرزەوان؛ سنووروان؛ کەسێ کە کێشکی سنوور دەدا: **مرزدار**

**مرزبانی** / marzbānî/: *اسم.* مەرزەوانی؛ سنووروانی: ١. کار و پیشەی مەرزەوان ٢. *[ـها]* مەزرینگەی ڕاگرتن و پاراستنی سنوور.

**مرزبندی** / marzbandî ، ـها/: *اسم.* سنوورێن؛ سنووربەندی؛ مەرزبەنی؛ کەوشەنبەندی: ١. بڕبەندی؛ کار و ڕەوتی دانان یا دیاری‌کردنی سنوور ٢. دیاری‌کردنی ئاقار یان هەرێمی هێمانەکانی سەر بە کۆمەڵە یان تاقمێ ‹مرزبندی سیاه و سفید: سنوورینی ڕەش و سپی›.

**مرزدار** / marzdār/ ☜ **مرزبان**

**مرزنگوش** / marzangûš ، ـها/: *اسم.* گوێ‌مشکە؛ گوێچکەمەلە؛ گوێچکەملە؛ گوێ‌ملە؛ مەرزنجۆش؛ ئاڵفەگیایەکی بۆنخۆش بە گوڵی بچووکی سپی یان ئاڵ، گەڵای ڕێکی هێلکەیی و سەرلقی گوڵدارەوە کە بۆ دەرمان دەشێ.

**مرزه** / marze ، ـها/: *اسم.* مەرزە؛ مەرسە؛ مەرزەک؛ فلفەلەک؛ گیایەکی گەڵاوردی تیژی بۆنخۆشە وشک دەکرێ و دەخورێ.

**مرزی** / marzî/: *صفت.* مەرزی؛ سنووری؛ کەوشەنی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە سنوور ‹اختلاف‌های مرزی: کێشەی سنووری› ٢. جێگرتوو لە کەوشەندا ‹شهر مرزی: شاری مەرزی›.

**مرس** / mors/: *[فرانسوی]* *اسم.* مۆرس؛ هەر کام لە دوو دەستە نیشانەگەلی دیتنی (بە شێوەی خاڵ و هێڵ) یا بیستنی (بە شێوەی فیکەی توند و هێواش) کە بۆ هەناردنی هەواڵی دووره ڕێ بەکار دەچێ: **مورس**

**مرسل** / morsal/: *[عربی]* *صفت.* ١. ناردراو؛ هەناریاگ (لە لایەن خوداوە، بۆ پێغەمبەری خاوەن کتێب دەگوترێ) ٢. ڕەوان؛ بێ‌گرێ ‹نثر مُرسَل: پەخشانی ڕەوان›.

**مرسله** / marsale ، ـها/: *[عربی]* *اسم.* ناراوە؛ ناردراوە؛ نێردراوە؛ هەناردە؛ نارياگ؛ ئەوەی بەتایبەت کەل‌وپەلێ کە لە لایەن کەس یان ڕێکخراوەیەکەوە بۆ شوێنێ بەڕێ‌کراوە.

**مرسولات** / marsûlāt/: *[از عربی]* جمعِ ☜ **مرسوله**

**مرسوله** / marsûle ، ـها؛ مرسولات/: *[از عربی]* *اسم.* نێردراوە؛ هەناردە؛ ناراوە؛ ناریاگ؛ کاڵا یان شتی نێردراو ‹مرسولەی پستی: هەناردەی پۆستی›.

**مرسوم** / marsûm/: *[عربی]* *صفت.* باو؛ ڕەسم؛ بەبرەو ‹شیوەی مرسوم: شێوەی باو›.

▣ **مرسوم بودن:** باو بوون؛ ڕسم بوون؛ بە برەو بوون ‹در گذشته این کار مرسوم بود: لە ڕابردوودا ئەم کارە باو بوو›. هەروەها: **مرسوم شدن؛ مرسوم کردن**

**مرسی** / mersî/: *[فرانسوی]* *دعا.* سپاس؛ سوپاس؛ زۆر مەمنوون؛ وشەی پێزانی، لە جوابی چاکەدا.

**مرشد** / moršed ، ـها؛ ـان؛ ـین/: *[عربی]* *اسم.* ١. *[تصوف]* پیر؛ شێخی تەریقەت؛ پێشەوا، بەتایبەت پێشەنگی تاقمێ سۆفی ٢. *[گفتاری]* سەرناوێ بۆ چاچۆڵباز و مارەکەگێڕ ٣. مورشید؛ مرشۆر؛ مرشید؛ بەڕێوەبەر یان کارگێڕی وەرزشی لە زۆرخانەدا.

**مرصد** / marsad/: *[عربی]* *اسم.* ڕوانگە؛ جێگەیەک کە لێیەوە دەڕوانن.

**مرصع** / morassa'/: *[عربی]* *صفت.* نقێم‌بەند؛ ڕازاوە بە بەرد یان کانزای گرانبایی.

**مرصع‌پلو** / morassa'polow, -polo/: *[عربی/فارسی]* *اسم.* جۆرێ پلاوی ڕازاوە بە گۆشتی

مریشک، خەلیلەی نارنج یان پرتەقاڵ، خەلیلەی بادام یان پستە، زریشک، کشمیش، ڕۆن و زافەران و...

**مرصع کاری** / morassa'kārî /: [عربی/ فارسی] *اسم.* نقێم‌بەندی؛ کار یان هونەری چێ‌کردنی نقێم‌بەند. هەروەها: **مرصع‌کار**

**مرض** / maraz ، ـها؛ امراض /: [عربی] *اسم.* دەرد؛ نەخۆشی؛ نەوەشی؛ نەخوەشی؛ نەخۆشین؛ نەخوەشین؛ پێگان؛ دەردە؛ لەش‌بەباری؛ بیماری.

◘ **مرض الموت**: نەخۆشی سەرەمەرگ؛ نەخۆشی لە سەر مردن.

مرض **جوع** ☜ بیماری جوع، **بیماری**

مرض **قند**: شەکەرمز؛ نەخۆشی شەکر/ قەن.

مرض **واگیر**: ئاهۆ؛ پەتا؛ ئازار؛ درم؛ نەخۆشی گیرۆ.

◘ مرض **داشتن**: *[تعریض]* نەخۆش بوون؛ نەوەش بیەی؛ دەردەدار بوون؛ تووشی نەخۆشی بەتایبەت ڕەوانی بوون ‹مرض داری این کارها را می‌کنی؟: نەخۆشی ئەم کارانە دەکەی؟›.

**مرضا** / marzā /: [عربی] جمعِ ☜ **مریض**

**مرضی** / marazî /: [عربی] *صفت.* پێوەندیدار بە نەخۆشیەوە.

**مرضی الطرفین** / marzîyottarafeyn /: [عربی] *صفت.* دوو لا لێ ڕازی؛ بە دڵی هەر دوو لای کێشە یان شەڕ.

**مرطوب** / martûb /: [عربی] *صفت.* ١. تەڕ ‹دستمال مرطوب: دەسرەی تەڕ› ٢. شێدار؛ شەدار؛ نمدار؛ بەنم؛ هیت؛ هوتن ‹هوای مرطوب: هەوای شێدار›.

**مرعوب** / mar'ûb ، ـان؛ ـین /: [عربی] *صفت.* ترساو؛ هەراسان؛ زات‌چوو؛ تۆقیو.

**مرعی** / mar'î /: [عربی] *صفت.* ڕەچاوکراو؛ بەرچاوگیراو.

**مرغ** / marq ، ـها /: *اسم.* ١. هەرێز؛ هەرێس؛ ون‌ئەور؛ گیایەکی ئالیکی بە لاسکی خزۆک، گەڵای کەسک و درێژی نووک‌تیژ و کالاندار، گوڵی سەوزی کاڵ و کۆی وەک هێشووی درێژ و بەری درێژۆکەی تۆم وردەوە ٢. *[قدیمی]* مێرگ؛ مێرگە؛ چیم.

**مرغ** / morq ، ـها /: *اسم.* مریشک؛ مامر؛ کارگ؛ کەرگی؛ کەرگە؛ کارگە؛ کارگی؛ موور؛ مر: ١. /ـها؛ ـان/ هەر کام لە گیاندارانی پەلەوەر کە لەشی پەڕاوی و پەلی وەک باڵیان هەیە ٢. /ـها؛ ـان/ باڵندەی کەوی، جووتی کەڵەباب ٣. دەیەمین ساڵ لە ساڵانی ساڵپێوی تورکستانی ☜ **تقویم**

◘ مرغ آتشین ☜ **فلامینگو**

مرغ **انجیرخوار** ☜ **انجیرخوار**

مرغ **باران** ☜ **سلیم**[1]

مرغ **بهشتی**: ١. پەلەوەرێ بە دەندووکی زل، پەنجەی بە هێز و پەڕی ئاڵەوە ٢. ☜ **مرغ‌بهشتی**

مرغ **توفان**: پەلەوەرێکی دەریایی بە دەندووکی وەک لوولە و باڵی درێژ و باریکەوە.

مرغ **حسینی** ☜ **فلامینگو**

مرغ **حق**: تووتاک؛ تووتەک؛ حەق‌حەق‌کەرە؛ قژاوکە؛ تاق‌تاق‌کەرە؛ تاک‌تاک‌کەرە؛ تاق‌تاق‌کەرە؛ هوموکەرە؛ قژاکە؛ پەلەوەرێکی بچووکە بە پەڕی خۆڵەمێشی و دەنگی ناخۆشەوە، مێروو دەخوا و زۆرتر شەوانە دەخوێنێ: **مرغ شباویز؛ مرغ شباهنگ**

مرغ **خانگی**: مریشک؛ مامر؛ مر؛ کەرکی؛ کەرگی؛ کەرگە: ١. پەلەوەری کەوی و ماڵی کە نافڕێ و بەتایبەت بە مێوینەکەی دەگوترێ کە بۆ هێلکە و گۆشتەکەی ڕایدەگرن ٢. ماکیان.

مرغ **زرین‌پر** ☜ **مگس‌گیر**

مرغ **سقا**: کەڕاوی؛ کەراقی؛ کەڵک؛ قووتان؛

زەرۆلـە؛ زورۆلـە؛ سـەقا؛ سـەقاو؛ سـەقاقوش؛ سـەقاکوژ؛ قوتـان؛ ماسـیچنـە؛ باڵـندەیێکی زەلامـی ماسـیخـۆرە، قـورتمێکی لـە خـوار دنــدووکی هەیــە ماســی و ئــاوی تێــدا هەڵدەگرێ.

مـرغ سـعادت: پـیرۆزە؛ هومـا؛ باڵـدارێکی چیرۆکانە بە سـەر هـەر کەسـدا سـێبەر بکـا دەبێتە شا.

مرغ شباویز ☜ مُرغ حق

مرغ شباهنگ ☜ مُرغ حق

مــرغ عشــق: باڵــندەیەکی دانــەخۆری دەستەمۆیە، بە ڕەنگی شین، زەرد، کەسـک و پیرۆزەیی، و برێ جاریش سـپی کـە دەنگـی وەک فیکە وایە.

مرغ غواص: کەرەسەرە؛ کەرسـەرە؛ کەرسـەڕ؛ پێدرێژە؛ باڵندەیەکی مەلەوانی باڵکورتە لـە سەر گژ و گیای سەر ئاو هێلانە دەکا.

مرغ ماهیخوار: قەلراو؛ قەلراوی؛ زیقاوە؛ شـاق؛ قووتان؛ ماسیخـۆرە؛ ماسـیگرە؛ ماسـیگرەک؛ ماسیگیرە؛ واک؛ واقواق؛ ماسـاوگێر؛ زیقـاوە؛ زیقاوڵە؛ پەلەوەرێکی گەورەی کەڕاویئاسـایە بە پێی کورت، دندووکی چەماوە و جـووچکی درێژەوە، ماسی دەخوا.

مرغ مقلّد ☜ مینا‌ـ۵

مرغ مگس‌گیر ☜ مگس‌گیر

مرغ مینا ☜ مینا ـ۵

◘ مرغ کسی یک پا داشتن: *[کنایی]* هەر دوو پـێ کردنە کەوشێکەوە؛ پێداگری کـردن لـە سـەر قسەی خۆ ‹مرغ او یک پا داشـت و حاضـر نبـود از حرفش برگردد: هەر دوو پای کردبووە کەوشـێکەوە و لە قسەکەی هەڵنەدەگەڕاوە›.

**مرغابی** / morqābî/: *اسم.* مراوی؛ مراو؛ مەراقـی؛ مراق؛ بەت: ۱. مـامراوی؛ بـورچین؛ تیرەیـەک باڵداری پێپەڕەداری مەلەوانـە کـەوی و کێـوی هەیە و لە قاز بچووکترە ۲. ـها؛ ـان/ پەلەوەرێکی کۆچەر، بە دەندووکی پان یان باریک و درێژەوە کە لە گیای ئاوی، دان و مێروو دەخـوا ۳. ـهـا؛ ـان/ سۆنە؛ سۆنێ؛ بتئاوی؛ شووش؛ وەردەکە.

◘ **مرغابی وحشی**: ئاڵەتانج؛ هەڵـەتانج؛ جۆرێـک مراوی کێوی سوور و سپی سەر بە کلاوەیە.

**مــرغ‌بهشــتی** / morqebeheštî/: *اسم. [نجـوم]* وێنەیەکی ئاسمانی لە نیوەگۆی باشووریدا.

**مرغداری** / morqdārî/: *اسم.* ۱. پیشەی ڕاگرتن و بەخێوکردنی مریشک ۲. ـها/ شوێنی ڕاگرتنی مریشک و جووچک.

**مرغدان** / morqdān/ ☜ **مرغدانی**

**مرغــدانی** / morqdānî ، ـهـا/: *اسم.* کـولێن؛ کولێـت؛ کولێتـە؛ کولانـە؛ کولینـە؛ قـن؛ پـین؛ جێگەی سەرگیراو بۆ ڕاگرتنی مریشـکی ماڵـی: **مرغدان**

**مرغزار** / marqzār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* گیاجاڕ؛ مەرخ؛ چیم؛ چەروان؛ چیمـەنزار؛ چیمـەن؛ مێرخـوزار؛ مێرغوزار؛ مێرگ؛ مەرخوزار؛ مـەرغوزار؛ شـەکار؛ مێرگەشە؛ مێرگوزار؛ مەڕن؛ قەرقیت؛ جێگەیەک کە گیای زۆری لێ ڕواوە.

**مرغک** / morqak ، ـها/: *اسم.* ۱. وارۆک؛ وارۆک؛ وارۆکـە؛ بارۆکـە؛ وارۆکلـێ؛ فـرووج؛ مریشـکی گچکە ۲. *[خیاطی]* جـۆرێ بڕشـت بـە شـێوەی سێگۆشە.

**مرغوب** / marqûb ، ـهـا/: [عربـی] *صفت.* چـاک؛ باش؛ خـاس؛ پەسـەند؛ بـەڕمێن؛ نـەخت ‹برنج مرغوب؛ زمین مرغوب: برینجی چاک؛ زەوینی باش›.

**مرغوبیت** / marqûbîyyat/: [عربی] *اسم.* چـاکی؛ باشی؛ نـەختی؛ پەسـندی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی سەرتر بوون لە چاوی باقی.

**مرفــق** / merfaq ، ـهــا/: [عربـی] *اسم. [ادبـی]* ئانیشک؛ هانیشک؛ هەنیشک؛ ئەنیشک؛ ئایسک؛ قۆلانیسک؛ بـالنج؛ بـە لـەمرک؛ مـرک؛ بەنـدی نێوان قۆڵ و باسک.

**مرفــــولژی** / morfolojî/: [فرانســـوی] ☜

ریختشناسی ــ۲

**مرفه** / moraffah ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.* پڕ و پۆشته؛ پۆشته و پەرداخ؛ کۆک؛ خۆش بژیو؛ ساز و تەیار؛ بە ژیانێکی ئاسوودە و بێکەمایەتی ‹انسان مرفه: مرۆی پڕ و پۆشتە›.

**مـــرفین** / morfîn/: [فرانســوی] *اســم. [شــیمی]* مورفین؛ ئالکالوییدێکی گرینگی خەشخاشە کە سڕکەر و ژانبڕە: **مُورفین**

**مرقد** / marqad ، ـها/: [عربی] *اسم.* خـزن؛ قسـن؛ مەرقەد؛ شەخس؛ چاکوپیر؛ پیر؛ چـاک؛ زێـوە؛ زیارەتگە؛ گلگۆی پیرۆزی پیاوچاکان.

**مرقـــع** / 'moraqqa ، ـهـا؛ ـات/: [عربـی] *اســم.* ۱. پارچە کاغەزێ کە خـەتی جـوانی لـە سـەر نووسـراوە ۲. کتێبـێ لـە بەرهەمگـەلی خـەتی جوان.

**مرقوم** / marqûm/: [عربی] *صفت. [ادبی]* نووسراو؛ نویسیا؛ نووسیاگ.

▣ **مرقوم داشتن/ فرمودن**: نووسین.

**مرقومـه** / marqûme ، ـهـا/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* نامە؛ نووسراوە ‹مرقومەی شریف واصل گردید: نامەی بەڕێزتان گەیشت›.

**مرکـــاس** / merkās/: *اســم. [گفتــاری]* تریــاک؛ تلیاک.

**مرکانتیلیسم** / merkāntîlîsm/: [فرانسـوی] *اسـم.* میرکانتیلیسم؛ ڕژیمێکی ئابووری کە لە کۆتـایی سەردەمی فیئۆدالی لە ئورووپادا سەریهەڵـدا و هەوڵــی دا بـە دانـانی قـانوون و نـەریتی ورد و ڕێکوپێکی حکوومەتی، بـە سـەر بـار و دۆخـی ئابووری وڵات و گەشە پێدانی کشـت و کـاڵ و بازرگانی و زۆرکردنی خەزێنەی زێڕ و زیو، وڵات لە باری داراییەوە بەهێزتر بکاتەوە: **سوداگری ــ۲**

**مرکــب** / markab ، ـهـا/: [عربـی] *اسـم.* سـواری؛ ئەوی سواری دەبـن (وەک ئەسـپ، دووچەرخـە و ماشین): **مرکوب**

**مرکب**[1] / morakkab ، ـهـا/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* ۱. مەرەکەب؛ هبر؛ مەرکەف؛ مرەکەو؛ مرەکەف؛ مەرکاو؛ مەرەکەو؛ تراوێکی ڕەشـە لـە دووکـەڵ دروست دەبێ، قەڵەمی تێدا ڕەنگ دەکەن و بـە سەر کاغەزیـدا دەنـێن ۲. جەوهـەر، بەتایبـەت جەوهەری ڕەش.

▣ **مرکـب چـاپ**: مەرەکـەبی چـاپ؛ جـۆرێ مەرەکەبی ڕۆنی کە لە چاپخانەدا بە کار دێ.

**مرکـب چـین**: مەرەکـەبی چـین؛ جـۆرێ مەرەکەبی ڕەش کە زۆرتر لە نیگارکێشیدا بە کار دەچێ.

**مرکب**[2]: *صفت.* ۱. لێکدراو ۲. *[شیمی]* تێکئـاڵاو؛ پێکهاتوو لە دوو یان چەن ماک بە شێوەیەک وا سووک و هاسان لێک جیـا نەبنـەوە ‹آب مرکـب است از اکسیژن و هیدروژن: ئاو تێکئاڵاوی ئوکسـیژن و هیدرۆژینە›.

**مرکبات**/ morakkabāt/: [عربی] *اسم.* مزرەمەنی: ۱. بـرێ دار و دەوەنی گوڵـداری تایبــەت بـە ناوچەگەلی فێنک و شێدار یان گەرم، بە گوڵـی بۆنخۆش و گـەڵای بریقـەدارەوە ۲. بـەری ئـەم دارانە، کە بە گشتی خڕیلە و گۆشتن و ئاودارن، ناوکەیان هەیە و دەخورێن (وەک پرتەقاڵ، لیمـۆ، نارنج و نارنگی).

**مرکبدان** / morakkabdān ، ـها/: [عربی/ فارسـی] *اسم.* ۱. دەوات؛ دەواتە؛ جەوهەر ۲. قوتووی جێ مەرەکەب لە دەزگای چاپدا.

**مرکبی** / morakkabî/: [عربی] *صفت.* مەرەکەفی؛ مەرەکەباوی؛ جەوهەری؛ بـە مەرەکەبـەوە تـلاو ‹دستم مرکبی شد: دەستم مەرەکەفی بوو›.

**مرکز** / markaz ، ـها؛ مراکز/: [عربی] *اسم.* ناوەنـد؛ ناوەین: ۱. چەق؛ هـەلێر؛ کـورەک؛ وەردێنـک؛ کروک؛ مۆنە؛ چۆنـگ؛ کـرۆک؛ نیڤـەک؛ خاڵـی ناوەڕاســتی تەشـکی هەندەسـی ‹مرکـز دایـرە: ناوەنـدی جـەغز› ۲. خـاڵ یـان شـوێنێ لـە نێوەڕاستی شتێکدا ‹مرکـز شـهر: نـاوەنـدی شـار› ۳. شوێنی چڕی یا کۆ بوونـەوەی شـتێ ‹مرکـز

کشاورزی: ناوەندی کشت و کاڵ› ٤. بنکە؛ چۆنگ؛ ناوەند؛ شوێنێ کە چالاکیەک لەوێدا چڕ و توند و تیژە ‹مرکز بهداشت: ناوەندی تەندروستی› ٥. بنکە؛ شوێنێ کە دەوێدا شتێک بڵاو دەبێتەوە یا بەڕێوە دەچێت ‹مرکز تبلیغات: ناوەندی بانگەشە› ٦. *[کنایی]* پاتەخت؛ پایتەخت.

▣ **مرکز ثقل:** گرانیگا؛ چەقی قورسایی؛ نیڤەکا ڕاکێشانێ.

**مرکزگرا** / markazgerā ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* مۆنەوار؛ ناوەندواز؛ نیڤەکخواز؛ هۆکارە و هۆگری ناوەڕاست.

**مرکزگریز** / markazgorîz ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* مۆنەبێز؛ ناوەندبێز؛ هۆکارە و هۆگری دوور کەوتنەوە لە ناوەند.

**مرکزی** / markazî/: [عربی] *صفت.* ناوەندی؛ ناوین: ١. پێوەندیدار یان هاوگەری ناوەند ‹حکومت مرکزی: حوکمەتی ناوەندی› ٢. لە نێوەڕاستدا ‹نقطەی مرکزی: خاڵی ناوەندی› ٣. سەرەکی؛ بنەڕەتی؛ ئەسڵی؛ بناغەیی ٤. پاتەختنشین.

**مرکزیت** / markazîyyat/: [عربی]/*اسم.* ناوەندێتی؛ ناوەندیەتی؛ ناوانی؛ مۆنەیی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی ناوەند بوون ‹مرکزیت اینجا خوب است: ناوەندیتی ئێرە چاکە›.

**مرکوب** / markûb/: [عربی] ☜ **مرکَب**

**مرکورکرم** / merkûrkorom, merkorkorom/: [فرانسوی]/*اسم.* دەرمانی سوور؛ تراوێکی جیوەداری سوورتۆخە کە دژگەنە و میکرۆب دەکوژێ.

**مرگ** / marg ، ـها/:*اسم.* مەرگ: ١. نەمان؛ نەمەنەی؛ ڕاوەستاوی یەکسەرە و هەمیشەیی هەموو چالاکیەکی ژیان (وەک هەناسە و شوارۆ) ٢. *[مجازی]* بنەبڕ؛ بالمیش؛ تاونا؛ دۆخ یان چۆنیەتی لە ناو چوون و هەڵپێچران ٣. *[تعریض، گفتاری]* گیر؛ گرفت.

▣ **مرگ طبیعی:** مەرگی خوایی؛ مەرگ بە هۆی پیری یا کز بوونی سروشتی لەشەوە.

**مرگ کسی:** مەرگی کەسێ؛ بە مەرگ کەسێک؛ سوێند بە گیانی کەسێ ‹مرگ من راست می‌گویی؟: مەرگی من ڕاست دەکەی؟›: **به مرگ کسی**

**به مرگ کسی** ☜ **مرگ کسی**

**مرگ مفاجا:** مەرگی کوتوپڕ؛ مردنی بە سەکتە.

▣ **به مرگ گرفتن که به تب راضی شود:** *[مجازی]* دەست بۆ زۆر بردن و بە کەم ڕازی کردن؛ بۆ دەست خستنی داخوازی خۆ، زۆرتر یان باری دژوارتر داوا کردن ‹اول قیمت را خیلی بالا گفتم و کم‌کم پایین آمدم، یعنی به مرگ گرفتم که به تب راضی شد: لە پێشدا زۆرم گوت و نەختە نەختە لێم داشکاند، واتە دەستم بۆ زۆر برد، بە کەم ڕازی بوو›.

**مرگ‌آسا** / margāsā/: *صفت.* ١. مەرگ‌ئاسا؛ وەکوو مەرگ ٢. *[کنایی]* تووش؛ سەخڵەت؛ یەکجار دژوار.

**مرگ‌آفرین** / margāfarîn ، ـان/: *صفت.* مەرگێن؛ مەرگهێنەر؛ مەرگ‌ئافەرین؛ بەدیهێنەری مەرگ.

**مرگ‌آور** / margāvar/: *صفت.* مەرگهێن؛ مەرگهێنەر؛ بەدیهێنەری مەرگ ‹جنگ‌افزارهای مرگ‌آور: جەنگامێری مەرگهێن›: **مرگزا**

**مرگابه** / margābe ، ـها/: *اسم. [تعریض]* حەرامەشەربەتاو؛ هەموو جۆرە خواردنەوەی ئەلکولی بەتایبەت شەراب.

**مرگبار** / margbār/: *صفت.* ١. مەرگبار؛ مەرگبارێن؛ بەدیهێنەری مەرگ بە سەر تاقمێکی زۆردا ٢. ڕۆح‌تۆقێن؛ زۆر ترسێنەر.

**مرگ‌بر** / margbar/: *دعا.* مەرگ بۆ؛ بمرێ؛ نەمێنێ ‹مرگ بر دیکتاتور: مەرگ بۆ ملهوڕ›.

**مرگزا** / margzā/ ☜ **مرگ‌آور**

**مرگ‌موش** / margemûš/: *اسم*. مەرگـەمووش؛ دەوامشـک؛ دەواملـە؛ دەرمـانێکی سـپیە لـە ئارسنیک، مشکی پێ دەکوژن.

**مرگ‌و میر** / marg-o-mîr ، ـها/: *اسم*. قڕ؛ قـڕان؛ مەرگ و تیـاچوون؛ مـەرگ و نـەمان؛ دۆخ یـان چۆنیەتی قڕ بوون، قڕ تێکەوتن، قڕ تێ‌بـەربوون، قڕ پێ وەربوون، مردنی بەکۆمەڵ.

**مرگ‌هراسی** / margharāsî/: *اسم. [روان‌شناسی]* ۱. ترس لە مردن ۲. تێکچوون و پەشـۆکان لـە ترسی مەرگ.

**مرمت** / marammat, maremmat ، ـها/: [عربی] *اسم*. کەلتە؛ کاری چاک‌کردن؛ چا کردنەوە؛ ساز و پەرداختەکردنەوەی رووخاو، شکاو یـان دڕاو.

هەروەها: **مرمت شدن؛ مرمت کردن**

**مرمر** / marmar/: *اسم. [زمین‌شناسی]* مـەرمـەڕ؛ جۆرێ بەردی ئاهەکیـە، لـە ژێـر تـەوژمی زۆردا وەک بلـۆری لـێ‌هـاتووە. زۆر جوانـە و بـۆ پەیکەرتاشی و رووکاری مالان بەکاری دەبەن.

**مرمـــری** / marmarî/: *صـفت*. مەرمـــەڕی: ۱. چێکراو لە مەرمەڕ ‹مجسمەی مرمری: کۆتەڵـی مەرمەڕی› ۲. مەرمەڕاسا؛ بە شێوە یان ڕواڵـەتی وەک مەرمەڕ.

**مرمرین** / marmarîn/: *صفت. [ادبی]* مەرمـەڕی؛ لە مەرمەڕ.

**مرمن** / mormon/: [؟] *اسم*. مورمۆن: ۱. لقێکـی خاچ‌پەرستی لە سەدەی نۆزدەهەم لـە ئـەمریکا سەری هەڵدا ۲. /ـها/ هـەر کـام لـە کەسـانی بڕوامەند بەو ئایینە.

**مرمــوز** / marmûz/: [عربـی] *صـفت*. ڕەمـزاوی: ۱. ڕەمزی؛ بە ڕاز و ڕەمز ‹حرفهای مرموز: قسـەی ڕەمـزاوی› ۲. *[مجـازی]* بـە نـاوەڕۆکی نادیـار و ئاڵـۆزەوە ‹علامـتهـای مرمـوز: نیشـانەگەلی ڕەمزاوی›.

**مرمی** / marmî ، ـات/: [عربی] *اسم*. گولـە؛ گـوللە؛ بەرکی؛ پڕتاڤیە؛ ئەو بەشە لـە فیشـەک کـە لـە پووکە جیا دەبێتەوە و بەرەو نیشانە دەڕوا.

**مرنو** / mernow, merno/: *صوت*. مڕناو؛ مـڕنیاو؛ مڕمیاو؛ دەنگی پشیلە، بەتایبـەت لـە جەنگـەی خەرزدا.

◘ **به مرنو افتادن**: *[تعریض]* بن‌کلک خوریـان؛ وە با هـاتن؛ کەوتنـە ئاڵۆشـەوە؛ هاتنـە ئاڵـۆش؛ خـورەک تێکـەوتن؛ داوای جـووت‌کـردن (بەتایبەت بۆ کچ دەگوترێ).

**مروارید** / morvārîd ، ـها/: *اسم*. ۱. مـرواری؛ مـاگرت؛ مـراری؛ دوڕ؛ بـەردی گرانبـایی و بریقـەداری نێـو قـاپێلکی نـەرملـەشـان ۲. دەوەنێکـی ڕازاوەیـە بـە گـەڵای ناسکۆڵـەی خـڕۆک، بـەری سـپی و زلی وەک هێشـووە مرواری چڕ.

**مـروت** / morovvat/: [عربی] *اسم*. مرۆڤـایەتی؛ ئینسانەتی؛ جوامێری؛ پیـاوەتی؛ مـروەت ‹گفتم مروت داشته باش، بـه ایـن بچـه‌هـا رحـم کـن: گـوتم مرۆڤایەتیت ببێ، بەزەییت بەم مندالانەدا بێتەوە›.

**مروج** / moravvec ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم*. برەودەر؛ پەرە(پێ)دەر؛ ڕەواجدەر: ۱. ڕمێنـدەر ‹مروج علم: پەرەدەری زانست› ۲. وە ئەسـتۆگری بـرەو پێـدان و کردنـە بـاو ‹مـروج کشـاورزی: برەودەری کشت و کاڵ›.

**مرور** / murûr, morûr/: [عربی] *اسم*. ۱. تێپـەڕ؛ کار و ڕەوتی ڕابردن ‹مرور زمـان: تێپـەڕی کـات› ۲. کاری چاو پێدا خشاندن؛ پێدا چوونەوە؛ پێدا هاتنەوە؛ تماشا کردنی تەواوی نووسـراوەیەک و خوێندنەوەی باسە گرینگەکانی.

◙ **مرور زمان**: تێپەڕینی کـات؛ ڕابـردنی کـات: ۱. بە سەر چوونی ماوەیێ بە سەر ڕووداوێکی ڕەچـاوکراودا ۲. *[حقـوق]* بـە سـەردا هـاتنی مۆڵـەتێک کـە پـاش ئـەوە هـیچ داخوازێـک نابیسرێ.

**مـروزی** / marvazî/: *صـفت. [قـدیمی]* مـەروی؛ پێوەندیـدار یـان هاوگـەری شـاری مـەرو لـە

تورکەمەنستانی ئێستادا.

**مرهم** / marham ، ـها/: [عربی]/اسم. [قدیمی] هەتوان؛ ئەتوان؛ مەڵهەم؛ مەرهەم؛ چرک؛ دەرمانی سەر برین.

**مرهون** / marhûn/: [عربی] صفت. قەرزدار؛ قەرزار؛ وامدار؛ دەیندار؛ ناچار بە سپاس کردن و ئەمەگناسی بە هۆی بەهرەوەر بوون لە چاکە یا خزمەتی کەسێ ‹او در این کار خودش را مرهون پدر زنش می‌داند: (ئەو) لەم کارەدا خۆی بە قەرزداری خەزوورەی دەزانێ›.

**مری** / merî/: [عربی]/اسم. زەنگلۆک؛ قوریژنک؛ لوولە ئاسایەک لە کۆندامی هەرسەکە لە نێوان گەروو و گەدەدا کە بە هێزی ماسوولکەکانی، خۆراک ڕادەگوێزێتە نێو گەدەوە: **سُرخنای**

**مریخ** / merrîx/: [عربی]/اسم. [نجوم] مریخ؛ بارام؛ لە گەڕۆکەکانی کۆمەڵەی خۆرە کە خولگەکەی کەوتۆتە نێوان زەوی و موشتەری و بە ۲۲ مانگ و نیو، بە دەوری خۆردا سووڕێک دەخوا: **بهرام**

**مرید** / morîd ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. مرید؛ مرۆد: ۱. [تصوف] پەیڕەوی پیری تەریقەت ۲. هۆگر؛ کەسێ کە لایەنگری نەپساوەی ئایین، شێوازی هونەری یان کەسێکی گەورەیە ‹مرید حافظ: مریدی حافز›.

**مریض** / marîz ، ـها؛ ـان؛ مرضا/: [عربی]/اسم. نەخۆش؛ نەوەش؛ ناخوەش؛ ناخۆش؛ بیمار؛ دەردەدار؛ دژی‌دار؛ لەش‌بەبار.

⊡ **مریض افتادن**: نەخۆش کەوتن؛ نەخوەش کەفتن؛ نەوەش‌کەوتەی؛ کەوتنە جێ.

**مریض بودن**: نەخۆش بوون؛ نەوەش بیەی؛ لەش‌بەبار بوون؛ بیمار بوون ‹مادرم مدتی مریض بود، سرماخورده: دایکم ماوەیێک نەخوش بوو›.

**مریض کردن**: نەخۆش خستن؛ نەوەش وسەی؛ بوونە هۆی نەخۆشی ‹نخور! اینها مریضت می‌کند: مەخۆ! ئەمانە نەخۆشت دەخا›.

**مریض‌احوال** / marîz'ahvāl/: [عربی] صفت. ناساق؛ ناکۆک ‹مدتی است مادرم کمی مریض‌احوال است: ماوەیەکە دایکم هێندێک ناساقە›.

**مریضخانه** / marîzxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. [قدیمی] نەخۆشخانە؛ خەستەخانە.

**مریضداری** / marîzdārî/: [عربی/ فارسی]/اسم. ۱. نەخۆشداری؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی هەبوونی نەخۆش لە ماڵدا ۲. پەرستاری؛ کار و ڕەوتی بەدەم نەخۆشەوە بوون و هۆش پێوەبوونی.

**مریضی** / marîzî/: [عربی]/اسم. [گفتاری] نەخۆشی؛ نەوەشی؛ ناخوەشی: ۱. لەش‌بەباری؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی نەخۆش بوون ‹این روزها مریضی از مردن بدتر است: ئەم ڕۆژانە نەخۆشی لە مردن خراترە› ۲. ـها/ نەخۆشین ‹مریضی‌اش چیست؟: نەخۆشیەکەی چیە؟›.

⊡ **از مریضی پا شدن**: چا بوونەوە؛ خۆش بوونەوە؛ هەڵسان؛ هەڵسانەوە؛ خاسەو بوون؛ لە نەخۆشی ڕزگار بوون و لە جێ هەستان.

**مریم** / maryam ، ـها/: [معرب]/اسم. مریەم؛ مەریەم؛ پەلەوشە: ۱. گیایەکی ئالیکی ڕازێنەرە لە تیرەی نێرگز، بە گوڵی ناوەناوەی باریک و درێژ و لووس و نووک‌تیژەوە ۲. گوڵەپووران؛ گوڵەداماگ؛ گوڵی سپی و هێشوویی و بۆنخۆشی ئەو گیایە.

**مریم‌گلی** / maryamgolî ، ـها/: [معرب/ فارسی] اسم. مەریەمی؛ گیایەکی ڕازێنەرە لە تیرەی نەعنا، بە گەڵای ئەستووری بەرامبەر و ڕەنگی کەسکی تۆخ و گوڵی سپی ئاماڵ بنەوشەوە.

**مریم‌نخودی** / maryamnoxodî ، ـها/: [معرب/ فارسی]/اسم. گیای لێڕەواری، بە ڕەگ و ڕیشووی دایمی، گەڵای گچکەی خۆڵەمێشی بڕە- بڕە و گوڵی سپی یان زەردەوە.

**مرینوس** / merînûs/: [فرانسوی]/اسم. مرینووس: ۱. پەزی ڕەگەز سپانیایی، بە خوریەکی سپی و نەرم و ناسکی بەنرخەوە ۲. جۆرێ قوماشی پەشمی بەرهەم‌هاتوو لە خوری ئەو ڕگەزە پەزە.

**مزاج** / mezāc, mazāc ، ـها؛ اَمزِجه/: [عربی]/اسم. ۱. خوو؛ خده؛ مگێز؛ مەزاج؛ تەبیات؛ مەیلی ئاکاری یان شێوەی وەڵامی عاتیفی ‹مزاج آتشین: خووی ئاگرین› ۲. حاڵ؛ دۆخی گیاندار لە باری چۆنیەتیگەلی ڕەچاوکراو، بەتایبەت لە باری لەش‌ساقی و نەخۆشینەوە.

◘ **مزاج کسی کار کردن:** زگی/ دلی کەسێ کار کردن؛ دەساو چوون ‹دو روز است مزاجش کار نکرده: دوو ڕۆژە زگی کاری نەکردووە›.

**به مزاج کسی ساختن:** پێ‌کەوتن؛ پێ‌کەفتن؛ کەوتە پنەی؛ لەگەڵ دۆخ و حاڵی کەسێکدا تەبا بوون ‹خربزه به مزاج من نمی‌سازد: کاڵەکم پێ ناکەوێ›.

**مـزاح** / mezāh, mazāh/: [عربی]/اسم./ادبی/ گاڵتە؛ شۆخی؛ حەمل؛ حەنەک؛ لەق؛ گەپ؛ گەپجاری؛ تەلفیس؛ گوندەڵ؛ کای؛ قومار؛ وازی؛ جەفەنگ؛ گاڵتە و گەپ ‹مزاح می‌کند: گاڵتە دەکا›.

◘ **مزاح کردن:** گاڵتەکردن؛ شۆخی‌کردن؛ وەش کەردش.

**مزاحم** / mozāhem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. ئازاردەر؛ زەحمەتدەر؛ زاوڵ؛ دەس‌پا گیر؛ هۆی دەردیسەر و ئازار ‹صدای مزاحم: دەنگی ئازاردەر›.

**مزاحمـت** / mozāhemat ، ـها/: [عربی]/اسم. ئازاردەری؛ کار یان ڕەوتی زەحمەت دان.

**مـزار** / mazār ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم./ادبی/ ۱. شەخس؛ نزرگە؛ قسن؛ زیارەت؛ چاک؛ زیارەتگا؛ پیر؛ مەرزەڵ؛ گڵکۆ؛ مەرقەدی پیاوچاکان ۲. زێوە؛ قەبر؛ گۆڕ.

**مزارع** / mazāre'/: [عربی] جمعِ ☜ **مزرعه**

**مزارعـه** / mozāre'e/: [عربی]/اسم. کشتیاری؛ بڕیارێ لە نێوان مالک و وەرزێڕدا، کە زەوی لە لایەن مالک و کشت و کاڵ لە لایەن وەرزێڕەوە بێ و داهاتیش بەش بکەن.

**مزاوجـت** / mozāvecat/: [عربی]/اسم./ادبی/ هاوسەری؛ ژن و مێردی؛ ژن و مێردایەتی؛ ژن و شوویی؛ ژناشوویی.

**مزایا** / mazāyā/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **مزیّت** ۲. سەربەشی؛ سەرپشکی؛ ئەو زیادە بەشانەی بە هۆی بار و دۆخێکی تایبەتیەوە بە مووچەخۆر دەدرێت ‹مزایای بدی آب و هوا: سەربەشی ناخۆش بوونی کەش و هەوا›.

**مزایده** / mozāyede ، ـها/: [عربی]/اسم. کێ‌زیاتر؛ جۆرێ فرۆش کە کاڵا دەدەن بەوەی بانترین بایی دەدا.

**مزبلـه** / mazbale ، ـها/: [عربی]/اسم./نامتداول/ زبڵدان؛ زبڵگە؛ جێ‌ئەشغاڵ؛ شەخەڵگا.

**مزبور** / mazbûr/: [عربی] ضمیر. ناوبراو؛ ناڤبری؛ کەس یان شتێ کە پێشتر ناوی لێ‌هاتووە ‹نامەی مزبور رسید: نامەی ناوبراو گەیشت›.

**مزخـرف** / mozaxraf ، ـها؛ ـات/: [عربی] صفت. ۱. مەراش؛ دزگین؛ بێ‌بایەخ؛ بێهۆ؛ بێخۆ ۲. ناشیرین؛ کەسن؛ دزێو؛ نەچێ؛ سک؛ نەشیاو؛ زشت ‹حرف مزخرف: قسەی ناشیرین›.

**مزد** / mozd ، ـها/:/اسم. مز؛ مزە؛ مژ؛ ماجوو؛ حەق: ۱. حەقی‌کار؛ حەقدەس؛ کارانە؛ کرا؛ کراهە؛ هاقە؛ ئاوان؛ پاداشی لە بەرامبەر کارەوە ‹دو روز کار کردی مزدت را هم گرفتی: دوو ڕۆژ کارت کرد، مزەکەشت وەرگرت› ۲. کراهە؛ کرا؛ مارانە؛ حەقدەس؛ هاقە؛ ئەوەی لە بەرامبەر ئەنجامدانی کار بۆ کەسێک، بە شێوەی ڕۆژانە یا حەوتانە دەسێندرێ (نە وەک مووچە کە پتر مانگانەیە) ۳. /مجازی/ جەزا؛ پاداش ‹بیست سال برای پسرش زحمت کشید، آخر مزد زحمتش را گرفت: بیست ساڵ بۆ کوڕەکەی ڕەنجی دا، دواخریش مزی خۆی وەرگرت›.

**مـزدا** / mazdā/:/اسم. مەزدا؛ خودای ئایینە ئێرانیەکان.

**مزدبگیر** / mozdbegîr ، ـها؛ ـان/: صفت./گفتاری/ بەراتخۆر؛ مزگر؛ مزەوەر؛ مزدەوەر؛ چیرەخۆر؛

کارکەری بە مز.

**مزدکاری** / mozdkārî/: اسم. مزکار؛ مزیٚ‌کار؛ ڕۆژمز؛ ڕۆژمزی؛ کار و ڕەوتی وەرگرتنی مز بە پیێ کاری ڕۆژانە، حەوتانە یان مانگانە. بەرانبەر: **أجرت‌کاری**

**مزدکی** / mazdakî/: صفت. مەزدەکی: ١. ـها؛ ـان/ هۆگر و شوێنکەوتووی مەزدەک، پێغەمبەری ئێرانی دەورانی ساسانی ( ـ ٥٢٩ی زایینی) ٢. پێوەندیدار یان سەر بە مەزدەک ‹آیین مزدکی: ئایینی مەزدەکی›.

**مزدوج** / mozdavac/: [عربی] صفت. جووت: ١. لێک‌جووت؛ دوانی؛ دوودانەیی ‹ستارەی مزدوج: ئەستێرەی جووت› ٢. ـین/ [نامتداول] خێزاندار؛ خاوەن ژن یان شوو.

**مزدور** / mozdûr، ـها؛ ـان/: صفت. مزبەر؛ کریێ‌گرتە؛ مزی؛ مزیار: ١. مزگر ‹کارگر مزدور: کرێکاری مزی› ٢. بەکریێ‌گیراو؛ خزمەتکەر بۆ پارە ‹تعدادی مزدور برایشان تظاهرات می‌کردند: بڕیێ بەکریێ‌گیراو ڕێپێوانیان دەکرد بۆیان›.

**مزدوری** / mozdûrî/: اسم. مزبەری؛ مزیاری؛ بەکریێ‌گیراوی؛ کار و ڕەوتی بە مز کارکردن.

**مزدی**[1] / mozdî/: صفت. مزی؛ مزدار؛ بە مز ‹کارِ مزدی: کاری مزی›.

**مزدی**[2]: قید. بە مز؛ مزی؛ لە بەرامبەر وەرگرتنی مزەوە ‹مزدی کار می‌کند: بە مز کار دەکا›.

**مزدیسنی** / mazdyasnî/: اسم. مەزدەیەسنی؛ دینی زەرتشت: **دین زرتُشت**

**مزرعه** / mazra'e، ـها؛ مزارع/: [عربی] اسم. مەزرا؛ مووچە؛ زەوی و زار؛ مەدار؛ کێڵگە؛ مەندا؛ زەوی؛ مەزرە؛ مەندە؛ هیگا؛ هێگا ‹مزرعەی گندم: مەزرای گەنم›.

**مزرعه‌دار** / mazra'edār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] اسم. مەزرادار؛ کێڵگەدار؛ زەویدار؛ کەسیێ کە زەوی و زارێک بەڕێوە دەبا.

**مزرعه‌داری** / mazra'edārî/: [عربی/ فارسی] اسم. مەزراداری؛ کێڵگەداری؛ کار و ڕەوتی کشت و کاڵ و بەڕێوە بردنی کار و باری مەزرا.

**مزروع** / mazrû'/: [عربی] صفت. کێڵراو؛ کێڵدراو؛ کاڵیا؛ کێڵیاگ؛ وەشێنراو؛ وەشیاگ؛ چێندراو؛ تایبەتمەندی زەوینیێ کە کشتوکاڵی تێداکراوە.

**مزروعی** / mazrû'î/: [عربی] صفت. ١. شیاوی کێڵان ٢. کێڵراو؛ وەشێنراو؛ وەشیاگ.

**مزغان** / mezqān/: [ترکی] ☜ **مزقان**

**مزقان** / mezqān/: [ترکی] اسم. [تعریض، گفتاری] زڕنا و دەهۆڵ؛ دایرە و دمەک؛ ئامێری مووسیقا: **مزغان**

**مزقانچی** / mezqānčî، ـها؛ ـان/: [ترکی] اسم. [تعریض] لۆتی؛ لۆتی-پۆتی؛ ژەنیار.

**مزگت** / mazget/: [آرامی] اسم. [قدیمی] مزگەوت؛ مزگت؛ مزگەفت؛ مزت؛ مزگد؛ مزگی؛ مزی؛ مزفت؛ شوێنی پەرستش.

**مزلف** / mozallaf/: [از زلف به قیاس عربی] صفت. [تعریض] ١. خوڕازێن؛ خۆگێفکەر (بۆ کوڕی جحێڵ) ٢. تایبەتمەندی کوڕ یان پیاویێ کە کەسانی‌تر سواری دەبن.

**مزمار** / mezmār/: [عربی] ☜ **چاکنای**

**مزمزه** / mazmaze/: [عربی] اسم. دەمەچێژە؛ چێژ؛ مژە؛ چەشکە؛ چێژکە؛ کاری چەشتنی شتیێ.

▣ **مزمزه کردن**: دەمەچێژە کردن؛ چێژکردن؛ ئەزمین؛ تامکردن: ١. چەشتن؛ چێژتن؛ چێژان؛ چەشتەی؛ چێژکەکردن؛ چەشکە کردن؛ تۆزقاڵێک لە شتیێ کردنە زارەوە بۆ بەراوەردی تامەکەی ٢. [کنایی] قرتەکردن؛ کەمۆکیێ لە شتیێ خواردن.

**مزمن** / mozmen/: [عربی] صفت. درێژخایەن؛ کۆن؛ بە پێشینەی مێژینە و درێژەدارەوە ‹بیماری مزمن: نەخۆشی درێژخایەن›.

**مزن‌هردم** / mazanhardam/: اسم. [تعریض] یارۆ؛ دوابڕاو؛ دوابڕیاگ؛ دمابڕیا؛ ئەوی ناوی

نەزانن یان نایانەوێ ناوی بەرن ‹آن مزن‌هردم را بده ببینم!: ئەو یارۆوەم بدەیە بزانم!›.

**مــزور** / mozavver ، ـهـا؛ ـان/: [عربـی] صـفت. ١. دوورِوو؛ ڕیایی‌کـەر؛ ڕووبـین؛ ڕیاکـار؛ ڕیابـاز؛ ڕواباز؛ ڕووباز؛ قسەمێچکە؛ مەرایی‌کەر؛ دووزوان؛ تایبەتمەنـدی خراپـەکارێ کـە بـە درۆ خـوی چاکـەکار نیشـان دەدا ٢. هـەنگباز؛ گزیکـەر؛ کەڵەکباز؛ گرنی‌باز؛ چەتلەمەر؛ تەپڕەشی؛ ڕیپـۆ؛ دەغـووڵ؛ دەغڵـباز؛ زەقـەڵ؛ فێڵـەواز؛ فێڵـباز؛ ساختەچی.

**مزورانـه** / mozavverāne/: [عربـی/ فارسـی] قید. فێڵەبازانە؛ ڕووبینانە؛ ڕیابازانە، بە فاک و فیک؛ بە درۆ و دەلەسە.

**مزوزوئیــک** / mezozo'îk/: [فرانســوی] اسـم. [زمین‌شناسی] میزۆزوئیـک؛ چـوارەمین قۆنـاغی مێژووی زەوی کە بە دەورانی دووەم دەناسرێ و پەلەوەر و گوانداری تێدا بەدیهاتن.

**مزوسفر** / mezosfer/: [فرانسوی] اسم. تـۆژێ لـە کـەش کـە لـە بـەرزایی نزیکـەی ٤٠ تـا ٨٠ کیلۆمیتری بان زەوی دەگرێتەوە.

**مــزون** / mezon/: [فرانســوی] اسـم. ١. ـهـا/ گــنج‌فرۆشــی؛ شــوێنی ڕانــانی جــل‌وبــەرگ ٢. [فیزیک] هەر کـام لـە وردیلـەکانی بنـەڕەتی ئەتوم کە پاش تەمەنی کورتی چەن لە هـەزاری چرکە دەبنە ئیلکتـرۆن، پـوزیترۆن و نوترینـۆ و زۆربەی جرمەکەشیان دەبێتە وزە.

**مـزه** / maz(z)e ، ـها/: اسم. تـام؛ چێـژە؛ چێـژ؛ چەژە؛ چەچە؛ چەش؛ چەشکە؛ چاژ؛ چاش؛ مێ؛ مـەزە؛ مـەی؛ چێشـکـە: ١. مـێلاک؛ مـیلاک؛ چست؛ چۆنیەتییێک لە برێ شتدا کە بەشێک لە ئەندامی چێژای دەبزوێنێ ‹مـزەی شـیرین: تـامی شـیرین› ٢. [مجـازی] هەسـتێ کـە بـە هـۆی ئەزموونـەوە پەیـدا دەبـێ ‹مـزەی پیـروزی: تـامی سـەرکەوتن› ٣. ئـەوەی لەگـەڵ خواردنـەوەی ئەلکولی دەیخۆن.

⊡ **مزه انداختن**: [گفتاری] قسەی خـۆش کـردن؛ قەرفین.

**مزه پراندن**: [گفتاری] گاڵتەکردن؛ گەپ لێدان؛ شۆخی‌کردن: **مزه ریختن**

**مزەی چیزی را چشیدن**: تامی شتێک چێژتن/ چەشـتن: ١. شـتێ چەشـکە/ چێژکـە/ تـام کردن؛ ملاک/ مێلاک کردنی شتێ؛ بۆ زانینی تامی شتێک، نەختێکی لە زار نان ‹مـزەی غـذا را چشیدن: چیشت چەشکە کـردن› ٢. [مجـازی] چەشـتن؛ چەشـە کـردن؛ بـە سـەر هـاتن و ئەزموون کردن ‹مزەی سرما را چشیدن: سـەرما چەشتن›.

**مزەی چیزی زیر دندان کسی مانـدن**: [کنـایی] نانێ خواردن بەو ڕۆنە و هەر مانەوە لەو شۆنە؛ تام چتێ لە بێخ دیان کەسێکا بـوون؛ شـوێن یان بیرەوەری شتێک هەر لە زەیندا مانەوە.

**مزه دادن**: [کنایی] تام دان؛ چێژە دان؛ خـۆش بوون: **مزه کردن**

**مزه داشتن**: ١. بـە تـام و چێـژ بـوون؛ تامـدار بوون؛ خۆش‌تام بوون ‹غذایش مزه داشت، بد نبود: چێشتەکەی بـە تـام و چێـژ بـوو، خـراپ نـەبوو› ٢. [مجازی] خۆش بوون ‹ مزه داشت اگر می‌رفت و می‌دید که ما برگشـتەایـم: خـوش دەبـوو ئەگـەر بچووبا و بیدیتبا ئێمە گەڕاوینەتەوە›.

**مزەی دهان کسی را فهمیدن**: [مجـازی] هـەوا/ بۆی دەمی کەسێک زانین؛ لە نیـازی کەسـێ تێگەیشتن؛ بە مرازی کەسێ زانین؛ مەیل یان خواستی کەسێ هەڵاوردن ‹اول مـزەی دهـانش را بفهم، بعد موضوع را مطرح کـن: پێشـتر هـەوای دەمی بزانە، ئەمجار بابەتەکە بێنە گۆڕێ›.

**مزه ریختن** ☜ **مزه پراندن**

**مزه کردن** ☜ **مزه دادن**

**از مـزه افتـادن**: [گفتـاری] بوونـە دەم مـردگ؛ بێ‌تام بوون ‹بیا دیگر! کباب سرد شد، از مزه افتـاد: دەیسا بێرەو! کەواوەکە سەردەو بوو، بـوو بـە دەم

مردگ›.

**مزیت / mazîyyat**، ـها: مزایا/: [عربی]/اسم. هەڤیازی؛ سەرتری: ١. لە باری چۆنیەتیەوە ‹این کفش‌ها مزیت زیادی دارد: ئەم کەوشانە هەڤیازی زۆریان هەیە› ٢. چاکی؛ باشی؛ خاسی؛ تایبەتمەندی دلخواز و لەباری شتێک لە چاو شتێ یان شتانی ترەوە ‹مزیت این یکی ارزانی آن است: چاکی ئەمە هەرزانیەکەیەتی›.

**مزید / mazîd**/: [عربی] صفت. زێدە؛ زیادکراو؛ لە سەرخراو.

◙ **مزید بر علت**: سەرباری دەردان؛ زیاتر لە نەخۆشی، گەزن یا گرفت.

**مزین / mozayyan**/: [عربی] صفت. ڕازاوە؛ ڕازاڤ؛ تەوزێنراو ‹میدان مزین به گل: مەیدانی بە گوڵ ڕازاوە›.

**مژدگانی / mojdeqānî**/: اسم. مزگێنی؛ مزگانی؛ مزگین؛ مزگانا؛ مزیانی؛ مزیانا؛ نزانی؛ مزانی؛ شیرانی؛ مژدانە؛ نوخشانە؛ نوقلانە؛ مژدە؛ مژدیان؛ مژدانی؛ شادیانە؛ دەمخۆشانەی ڕووداوی خۆش ‹مژدگانی بدهید ماشین پیدا شد: مزگێنیم بدەنێ ماشینەکە دۆزرایەوە›.

**مژده / mojde**/: اسم. مزگێنی؛ مزگانی؛ مزیانی؛ مزانی؛ نێد؛ نزان؛ مژدە؛ چاوڕوونی؛ چاوڕۆشنی؛ دلڕوونی؛ هەواڵی دلخۆشکەر؛ خەبەری خۆش.

◙ **مژده آمدن**: مزگانی هاتن؛ مزگانی گەیشتن؛ هەواڵی دلخۆشکەر و بەکەلک گەیین.

هەروەها: **مژده آوردن؛ مژده دادن؛ مژده رسیدن**

**مژده‌بخش / mojdebaxš**/: صفت. نزاندەر؛ مزگانیدەر؛ هۆی مزگانی و چاوڕۆشنی.

**مژک / mojak**، ـها/: اسم. [زیست‌شناسی] مژەک؛ چووزێکی تەسک و ناسکی مووئاسا کە لە ژمارێکی زۆردا بە دەوری برێ سیللوولدایە و بە جوولانەوەی، سیللوولەکە و تراوی دەوروبەری دێنێتە جووڵە.

**مژگان / mojgān**/: جمعِ ☜ **مژه**

**مژه / moje**، ـها: مژگان/: اسم. ١. برژانگ؛ بژانگ؛ بژۆل؛ برژۆل؛ بژۆل؛ مژۆل؛ کڤلیشک؛ برژانگی؛ مەژوولانک؛ مژوانک؛ بژۆلک؛ میژۆل؛ میژولانک؛ برژاو؛ برژان؛ موژین؛ مژا؛ مژان؛ مژانگ؛ مژەو؛ مجەو؛ مرژنگ؛ میرزینگ؛ مووی کورت و زبری سەر لێواری پێلوو ٢. مژەک.

◙ **مژه روی/ بر هم گذاشتن**: *[کنایی]* سەر خەو شکاندن؛ چاو نانەوە؛ سەرێ نیانەوە؛ چاو گەرم‌کردن؛ چەم پێوەنە نیای؛ تۆزێ خەوتن ‹سر و صدا نگذاشت مژه روی هم بگذارم: قرم و قاڵ نەیهێشت سەر خەوێ بشکێنم›.

**مژه نزدن**: پێلوو نەبزواندن؛ چاو لە سەر یەک نەنان؛ چاو دانەخستن؛ چاو نەترووکاندن؛ چەم نەترووکنەی ‹چشم دوخته بود به بچه و مژه هم نمی‌زد: چاوی بڕیبووە منداڵەکە و پێلووی نەدەبزواند›.

**مس / mes**/: اسم. مس؛ مەس؛ پاقر؛ پاخر؛ توخمی کیمیایی کانزایی بە ژمارەی ئەتومی ٢٩ و کێشی ئەتومی ٦٣,٥٤، بە ڕەنگی سووری ئاماڵ نارنجی کە لە ئاودا ناتوێتەوە و لە پیشەسازیدا دەورێکی زۆری هەیە و دەفر و ئامرازیشی لێ دروست دەکەن ٢. مسی؛ هەر کام لە بەرهەمگەلی چێکراو لە مس.

**مسائل / masā'el**/: [عربی] ☜ **مسایل**

**مسابقات / mosābeqāt**/: [عربی] جمعِ ☜ **مسابقه**

**مسابقه / mosābeqe**، ـها: مسابقات/: [عربی]/اسم. ملە؛ ڕکە؛ کێبەرکێ؛ کێ‌وەلکانی؛ پێشبڕکێ؛ هاڤبڕکێ؛ بەریکانێ؛ مل‌ملنێ؛ مل‌بەملێ؛ مل‌بەملە؛ شەقین؛ هەڤدووبرن؛ بۆڕێن؛ بەربەرەکانێ؛ بەرامبەرکێ؛ ڕکەبەری: ١. کاری هاوکاتی دوو یا چەن کەس یان تاقم بۆ کەوتنە پێش لە یەکتر و گەیشتن بە ئامانجێکی هاوبەش ٢. ڕێ‌وڕەسمێک بۆ ناسین و دیاری

کـردنی چـاکترین لێهـاتوویی و داهێنـان لـە بوارێکی دیاریکراودا ‹مسابقەی هـوش: کێبەرکێی هۆش›.

▣ **مسـابقەی امـدادی:** جـۆرێ کێبـەرکێ لـە وەرزشە مەودایيەکاندا (وەک غارغارێن و مەلـە و...) کە هەر کام لە ئەندامانی تیم بەشـێ لـە مەودای کێبەرکێ دەپێون.

**مسابقەی اسب‌دوانـی:** ماهینانـێ؛ گرێوەغـار؛ قۆچ؛ قۆشەنیان؛ پرتافێن.

**مسابقەی برگشت:** ملەی گەڕانەوە؛ دووهـەمین خول لە کێبەرکێی دووقۆناغیدا.

**مسـابقەی بیسـت‌سـوآلی:** ١. بیسـت‌پرسـیار؛ جۆرێ کێبەرکێ کە بەشدار دەبێ بتوانـێ بـە بیست‌پرسیار، وەڵامەکە هەڵـبێنێ ٢. *[کنـایی]* پرس و پرسیاری زۆر و ناڕەوا.

**مسابقەی رفت:** ملەی چوون؛ یەکـەمین خـول لە کێبەرکێی دووقۆناغیدا.

▣ **مسـابقە دادن:** کێبــەرکێ کــردن؛ ملــەکردن؛ کـێ‌وەلـکانی کـەردەی؛ بەشـداری‌کـردن لـە مل‌بەملەدا.

**مسـابقە را بـاختن:** دۆڕان؛ دۆڕانـدن؛ دانـان؛ کێبەرکێ دانان.

**مسـابقە را بـردن:** بردنـەوە؛ سـەرکەوتن لـە کێبەرکێدا.

**مساجد** / masāced/: [عربی] جمعِ ☜ **مسجد**

**مسـاح** / massāh ، ـان؛ ـیـن/: [عربـی]/اسـم. ئەندازەگر؛ پێوەر؛ لەگەزدەر؛ ڕووپێو؛ ڕووبـەرپێو؛ ئەوی زەوی لە گەز دەدا و دەیپێوێ.

**مساحت** / masāhat ، ـها/: [عربـی]/اسم. ڕووبـەر؛ پانتایی: ١. بەشێ لە ڕووی زەوی ‹آب مساحتـی را فرا گرفته بود: ئاو ڕووبەرێکی داگرتبوو› ٢. ڕوویـێ کە دەکەوێتە نێوان کۆمەڵێ هێڵ و سـنوورەوە، بەتایبەت بە گوێرەی یەکەیەکی پێوانەیی (وەک میتری چوارگۆشە، هیکتار و...).

**مساحقە** / mosāheqe/: [عربـی] ☜ طبـق زدن، طَبَق

**مسـاحی** / massāhî ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ئەنـدازەگری؛ ڕووپێـوی؛ ڕووبـەرپێوی؛ کـار و ڕەوتی لەگـەزدان و حسـێب‌کـردنی پانتـایی ڕووبەرێک.

**مساعد** / mosā'ed/: [عربی] *صفت. [مجازی]* تـەبا؛ لــەبار؛ ســازگار دەگــەڵ خواسـت و دۆخـی ڕەچاوکراودا ‹هوای مساعد: کەشی تەبا›.

**مسـاعدت** / mosā'edat ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ئاریکـاری؛ یارمـەتی؛ یـاردم؛ یاریـدە؛ یـاردەی؛ یاری؛ کۆمەک؛ کۆمـەگ؛ مەهـەت ‹با مساعدت همسـایگان، کوچـە را تمیـز کـردیم: بـە ئاریکـاری هاوسێکان کۆڵانەکەمان خاوێن کردەوە›.

**مسـاعدە** / mosā'ede ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ١. پارەیێ کـە مووچـەخۆر یـان کرێکـار لەبـەر ئاتاجی زۆر، بەر لە کاتی خۆی لە خاوەن کـاری وەردەگرێ ٢. پارە یـان شـتێکی بایەخـدار کـە پێشەکی بە کەسێک دەدرێ.

**مساعی** / masā'î/: [عربی] جمعِ ☜ **سَعی**

**مسافات** / masāfāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مسافت**

**مسـافت** / masāfat ، ـها؛ مسافات/: [عربـی]/اسم. مەودا؛ دۆرینگ؛ نێوان؛ دوورایی؛ ناو؛ نێوانی دوو شت یان دوو شوێن ‹مسافت سقز تا ماکو: مـەودای سەقز تا ماکو›.

▣ **مسافت دید:** بەتار؛ هەتەری چاو؛ بڕوو چـەما؛ تا ئەو ڕادە چاو کار دەکا.

**مسافت‌سنج** / masāfatsanc ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. مەوداپێو؛ کەرسـتەیەک بـۆ پێـوانی مـەودا بەبێ کەلک وەرگرتن لە میتر و گوریس.

**مسافت‌نما** / masāfatnemā ، ـها/: [عربی/ فارسـی] /اسم. مەودانوێن؛ تابلۆ، پەڕە یان بەردێکی لـووس لــە قــەراخی ڕێـدا کـە مـەودای شـوێنێ تـا شوێنێکی‌تری لە سەر نووسراوە.

**مسـافر** / mosāfer ، ـهـا؛ ـان؛ ـیـن/: [عربـی]/اسم. ڕێبوار؛ ڕێوار؛ ڕێبگار؛ ڕێوگار؛ ڕابگار؛ ڕاویار؛ ڕێبار؛

گەشتیار؛ مسافر؛ مسافیر: ١. ئەو کەسەی بۆ شوێنێ بەڕێوەیە ٢. کەسێ کە بڕیارە بچێتە سەفەر ‹تو فردا مسافر هستی، امشب زودتر بخواب: تۆ بەیانی ڕێبواری، ئەمشەو زووتر بنوو›.

◘ مسافر برون شهری: ڕێبواری دەرەشار؛ کەسێ کە دەچێتە دەرەوەی شار (وەک بۆ شارێ‌تر).

مسافر بین راهی: مسافری ناوڕێ؛ مسافری ناوەڕێ؛ کەسێ کە لە نێوان ڕێگادا سوار دەبێ.

مسافر درون شهری: مسافری ناوشار؛ مسافری ناوشاری؛ کەسێ کە لە ناو شارێکدا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێ‌تر دەڕوا.

**مسافربری** / mosāferbarî/: [عربی/ فارسی]/اسم. مسافربەری: ١. کار و ڕەوتی هەڵگرتن و گواستنەوەی مسافر ٢. /ـها/ دامەزراوەیێ کە کاری گواستنەوەی مسافرە.

**مسافرت** / mosāferat ، ـها/: [عربی]/اسم. گەشتیاری؛ کار و ڕەوتی چوونە سەفەر.

◘ مسافرت رفتن: چوونە سەفەر؛ سەفەرکردن ‹رفته بود مسافرت فرنگ: چووبووە سەفەری فەرەنگ›.

**مسافرتی** / mosāferatî/: [عربی] صفت. گەشتیاری؛ پێوەندیدار یان سەر بە سەفەر ‹آژانس مسافرتی: ئاژانسی گەشتیاری›.

**مسافرخانه** / mosāferxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. میوانخانە؛ مسافرخانە؛ جێگەی شەومانەوەی میوان بە کرێ.

**مسافرکش** / mosāferkeš ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. مسافربەر؛ مسافرکێش؛ کەرەسەی گۆزانەوەی مسافر.

**مسافرکشی** / mosāferkešî/: [عربی/ فارسی]/اسم. مسافرکێشی؛ کار و ڕەوتی هەڵگرتن و گواستنەوەی مسافر، بە کەرەستەی گۆزانەوە.

**مسافری** / mosāferî/: [عربی] صفت. گەشتیاری؛ ڕێبواری؛ مسافری؛ پێوەندیدار یا سەر بە مسافر.

**مساکن** / masāken/: [عربی] جمعِ ☜ **مَسکَن**

**مساکین** / masākîn/: [عربی] جمعِ ☜ **مسکین**

**مسالمت** / mosālemat/: [عربی]/اسم. ئاشتیخوازی ‹این جور اختلافها با مسالمت بهتر حل می‌شود: ئەم جۆرە ناکۆکیانە بە ئاشتیخوازیەوە باشتر چارەسەر دەبێ›.

**مسالمت‌آمیز** / mosālematāmîz/: [عربی/ فارسی] صفت. ئاشتیخوازانە؛ هاوڕێ دەگەڵ ئاشتیدا.

**مسالمت‌جو** / mosālematcû ، ـیان/: [عربی/ فارسی] صفت. ئاشتیخواز؛ لاشەڕ؛ هۆگری ئاشتی و تەبایی. هەروەها: **مسالمت‌جویی**

**مسأله** / mas'ale/: [عربی] ☜ **مسئله**

**مسامات** / masāmāt/: [عربی]/اسم. [قدیمی] کونیلە؛ کونجک؛ کونچک؛ کونە وردیلەی پێست.

**مسامحه** / mosāmehe ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. پشووودرێژی؛ بێنفرەهی؛ پرزەداری؛ تەوات ‹در زندگی مشترک باید قدری مسامحه به خرج داد: لە ژیانی هاوبەشیدا پێویستە هێندێک پشوودرێژی بکرێ› ٢. کەمتەرخەمی؛ سستی ‹اگر بخواهی مسامحه کنی، کار خراب می‌شود و بیرونت می‌کنند: ئەگەر بتەوێ کەمتەرخەمی بکەی، کارەکە تێکدەچێ و دەرت دەکەن›.

**مساوات** / mosāvāt/: [عربی]/اسم. بەرانبەری؛ یەکسانی؛ وەکیەکی: ١. [حقوق] بەرامبەری هەموو خەڵکی وڵاتێک لەباری ماف و ئەرکەوە، بەبێ لە بەر چاوگرتنی ژن یان پیاو بوون، تەمەن، نەتەوە، ئایین، زمان، بیر و ڕا و... ٢. [ادبی] هاوتا هاتنەوەی تێکوڵ و کاکڵی قسە.

**مساوی** / mosāvî/: [عربی] صفت. بەرامبەر؛ بەرانبەر؛ بەرابەر؛ یەکسان؛ وەک یەک؛ هەفیەک؛ وەکەهەڤ؛ چوون یەک؛ لێکولێک؛ یاو ‹سهم مساوی: بەشی بەرامبەر›. هەروەها: **مساوی بودن؛ مساوی شدن؛ مساوی کردن**

**مسایل** / masāyel/: [عربی] جمعِ ☜ **مسئله: مسائل**

**مسئلت** / mas'alat/: [عربی]/سم. تکا؛ داخواز؛ خوایشت؛ کاری داواکردن و خواستن.

◘ **مسئلت داشتن:** داوا کردن؛ تکا کردن؛ داواکار/ تکاکار بوون ‹بهبودی سریع ایشان را مسئلت داریم: چا بوونەوەی زووبەزوویان داوا دەکەین›.

**مسئله** / mas'ale ، ـها؛ مسایل/: [عربی]/سم. کێشە؛ پرس: ۱. پرسیار؛ بابەتێ کە پێویستی بە بۆگەڕان و لێکۆڵینەوە و ڕێگاچارە دۆزینەوەیە ‹مسئلەی بیکاری: کێشەی بێکاری› ۲. باسێکی بیرکاری یان فیزیکی لەمەڕ دۆزینەوەی وەرامی پرسیارێک ۳. پرسیارێکی دژوار کە بێ پەرسڤ ماوەتەوە ‹مسئلەی پیدایش گیتی: پرسی سەرهەڵدانی جیهان› ٤. [مجازی] گرفت؛ گێچەڵ؛ سەرچاوەی نارەحەتی، پەرێشانی و ئاڵۆزی ‹باز با هم مسئله پیدا کردند: دیسان کێشەیان لێ پەیدا بوو› ✱ **مسأله**

**مسئلەدار** / mas'aledār ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. گێچەڵدار؛ کێشەدار؛ خاوەن گرفت یان بابەتێکی شیاوی لێکۆڵینەوە ‹ این کارهای مسئلەدار را برای ما نیاور! : ئەم کارە گێچەڵدارانەمان بۆ مەهێنە!›.

**مسئول** / mas'ûl ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/سم. بەرپرس؛ لێپرس؛ لێپرسراو؛ مەسئوول؛ بەرپرسیار: ۱. سەرپەرشت ‹مسئول فروشگاه: بەرپرسی فرۆشگە› ۲. بەرعۆدە؛ وەڵامدەر (بەتایبەت لەباری ڕامیاری و لە بەرانبەر پێگەیێکی ڕەسمیەوە) ۳. هۆ؛ هۆکار ‹شاه مسئول از بین رفتن استقلال کشور بود: شا بەرپرسیاری لە ناو چوونی سەربەخۆیی وڵات بوو›.

**مسئولیت** / mas'ûlîyyat ، ـها/: [عربی]/سم. بەرپرسی؛ بەرپرسیەتی؛ لێپرسراوی؛ ئەرک: ۱. دۆخ یان چۆناوچۆنی بەرپرس بوون ‹مسئولیت مدرسه با شماست: بەرپرسی قوتابخانە بە ئێوەیە› ۲. کار یان پیشەیێ کە پێویستی بە وەڵامدانەوە لە هەمبەر کەس یان کەسانێکەوەیە.

◘ **مسئولیت کاری را پذیرفتن/ به عهده گرفتن/ قبول کردن:** ئەرکی کارێ گرتنە ئەستۆ؛ بەرپرسیاری کارێ وەئەستۆگرتن؛ بەڕێوە بردن، سەرپەرشتی یان وەڵام دانەوەی دوارۆژی کارێک وەئەستۆ گرتن.

**مسئولیت پذیری** / mas'ûlîyyatpazîrî/: [عربی/ فارسی]/سم. خۆ و خدە و لێهاتوویی لە وەرگرتنی کار و بەرپرس بوونیدا.

**مسئولیت گریزی** / mas'ûlîyyatgorîzî/: [عربی/ فارسی]/سم. کار یان ڕەوتی لە ژێر کار دەرچوون و کەمتەرخەمی لە بەرپرس بووندا.

**مسب** / massab/: [از عربی]/سم. [گفتاری] مەزەو؛ مەسەو؛ مەسەب؛ ئایین ‹مگر شما دین و مسب ندارین؟: ئەرێ ئێوە دین و مەزەوتان لا نیە؟›.

◘ **مسبت را شکر:** ئەی بە زیاد نەبێ؛ خوا بیوڕێ؛ ئەی خوا بڕڕۆش ‹مسبت را شکر، دو روز است هیچی نخوردم: ئەی بە زیاد نەبێ، دوو ڕۆژە هیچم نەخواردووە›.

**مسبار** / mesbār/:/سم. ئالیاژی بۆر؛ تێکەڵی چەند کانزای وەک قەلایی، سرپ و بڕێ جار هەندێ ئانتیموان و مس.

**مسبب** / mosabbeb ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/سم. هۆ؛ هۆکار؛ باییس؛ بەدیهێنەری شتێ ‹خرافات مسبب عقب‌ماندگی مردم شده است: کۆنەپەرستی هوی دواکەوتوویی خەڵکە›.

**مسبوق** / masbûq/: [عربی] صفت. ۱. پێشینەدار ‹این کار مسبوق به سابقه است: ئەم کارە پێشینەدارە› ۲. [مجازی] ئاگادار؛ ئاگا؛ هاگا؛ خەوەردار ‹جنابعالی مسبوق هستید، چه کار مشکلی است: جەنابتان ئاگادارن چ کارێکی دژوارە›.

**مست** / mast ، ـها؛ ـان/: صفت. مەست؛ مەس: ۱. لوول؛ گیز؛ سەرگران؛ سەرگەرم؛ مەستوور؛ تووشی مەستی ‹مست کرده است: مەستی

کـردووه› ۲. *[مجـازی]* سەرمەسـت؛ سـەرخۆش؛ سەروەش؛ پۆزبەران؛ زۆر خۆشحاڵ و شاد ‹مست موفقیـت: سەرمەسـتـی سـەرکەوتن›. هـەروەها: **مست بودن؛ مست شدن؛ مست کردن**

◘ **مست لایعقل:** ڕەشەمەست؛ مەسـتی مەسـت؛ تەلەس؛ زۆر مەست و سەرخۆش.

◘ **مست چیزی بودن:** لوولی شتێ بـوون؛ تـەواو دەنیۆ یان لەبەر شتێکی خۆشدا بـوون ‹وقتی در زدند مست خواب بودم: کاتێ زەنگیان دا، لـوولی خەو بووم›.

**مستأجر** / mosta'cer ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی] *اسـم.* کرانشین؛ کرێنشین؛ کراهەنشین؛ کرایەنشین.

**مستأصـل** / mosta'sal/: [عربـی] *صـفت.* دامـاو؛ داماگ؛ بێچارە؛ پەککەوتە؛ قەتیس. هـەروەها: **مستأصل بودن؛ مستأصل شدن؛ مستإصل کردن**

**مستانه**[1] / mastāne/: *صفت.* مەسـتانە؛ مەسـانە؛ وەک مەستان ‹خندەی مستانه: قاقای مەسـتانە›.

**مستانه**[2]: *قید.* مەستانە؛ مەسانە؛ مەست ـ مەسـت؛ وەکـوو مەسـت ‹مسـتانه راه مـی‌رفـت: مەسـتـانە دەڕۆی›.

**مست‌بازی** / mastbāzî ، ـها/: *اسم.* مەست‌بـازی؛ مەس‌بازی ‹توی خیابان شروع به مست‌بازی کردند: لە ناو شەقامدا دەستیان کرد بە مەست‌بازی›.

**مسـتبد** / mostabed(d)/: [عربـی] *صفت.* لاسـار؛ سەرەوڕۆ؛ هەڵەشە؛ خۆڕا؛ بلـەوەز ‹پسر مستبد و پدر بیچارە: کوڕی لاسار و باوکی هەژار›.

**مسـتبدانه** / mostabed(d)āne/: [عربـی/ فارسـی] *قید.* لاسارانە؛ هەڵەشەیانە؛ سەرەڕۆیانە؛ خۆڕایانە؛ بە بلەوەزیـەوە ‹مسـتبدانه رفتـار مـی‌کـرد: لاسـارانە دەجووڵایەوە›.

**مسـتتر** / mostater/: [عربـی] *صـفت.* شـاراوە: ۱. پۆشـراو؛ داشـاردراو؛ داپۆشـراو ۲. پـەنام؛ بەرپێوار؛ پەنهان؛ نهێنی.

**مسـتثنا** / mostasnā ، مسـتثنیات/: [عربـی] *صـفت.* ۱. جیاوەکراو؛ جیاکراوە؛ بەدەرکراو؛ جیاوەکریـا؛ هەڵاواردراو ۲. *[مجازی]* هەڵبژاردە؛ هەڵـبژاردوو؛ هەڵاواردە؛ هەڤیاز ✽ **مستثنی**

**مستثنی** / mostasnā/: [عربی] ☜ **مستثنا**

**مستثنیات** / mostasnay(y)āt/: [عربی] جمعِ ☜ **مستثنا**

**مستجاب** / mostacāb/: [عربی] *صفت.* وەرگـیراو (پتر لەمەڕ نزاوە) ‹اگر دعـای سـگ مسـتجاب بـود از آسـمان اسـتخوان مـی‌باریـد: ئەگـەر دوعـای سـەگ وەرگیراو بایە لە ئاسمانەوە ئێسقان دەباری›.

**مستحب** / mostahab(b) ، ـها؛ ـات/: [عربی] *صفت.* ۱. چاک؛ نووک؛ بـاش؛ جـێ پەسـن ۲. *[اسـلام]* موستەحەب؛ تایبەتمەندی کارێـک کـە کـردنی باشە و پاداشی هەیـە بـەڵام نـەکردنی بـە گونـا نانووسرێ.

**مسـتحدث** / mostahdas ، ـات/: [عربـی] *صـفت.* ۱. تازەبـاو؛ نوێبـاو؛ نوێژەنکـار؛ تازەداهـات؛ تازەپەیـدا؛ تازەداهـاتوو؛ تازەهـاتوو؛ نۆبـەرە؛ نۆبنیات ۲. تازاوا؛ تازەئاوا؛ نۆئاوا؛ تازەکراوە.

**مسـتحدثات** / mostahdasāt/: [عربـی] *اسـم.* تازەکراوان؛ هەموو ئەو شتانەی کە دواتر یان بـە تازەیی دروست‌کراون (وەک ماڵ، ڕێ و...).

**مستحسـن** / mostahsan/: [عربـی] *صـفت.* *[ادبـی]* چاک؛ باش؛ جوان؛ نووک؛ پەسەن‌کراو.

**مستحضر** / mostahzar/: [عربـی] *صـفت.* ئاگـادار؛ هاگادار؛ بە ئاگا؛ خەبەردار؛ ئاگـەدار؛ بـە خەبـەر ‹مستحضر هستید که مـدتی است حقـوق نگرفتـه‌ایـم: ئاگەدارن کە ماوێکە مووچەمان وەرنەگرتووە›.

**مستحفظ** / mostahfez ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* پاسـەوان؛ پاسـەبان؛ پـازگر؛ پاسـگر؛ نـواوان؛ پارێزبان؛ نۆترڤان؛ نۆتر؛ نیابان؛ نگابان؛ نیاوان.

**مستحق** / mostahaq(q) ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی] *صفت.* ۱. ئاتاج؛ داماو؛ چاو لە کۆمـەک؛ شـیاوی دەس گرتن و یارمەتی دان ‹مستحق است کمکش کنید!: ئاتاجە کۆمەکی بکـەن!› ۲. سـزاوار؛ شـیاو؛ جێ ‹او مستحق سرزنش بود: شیاوی لۆمە بوو›.

**مستحکم** / mostahkam/: [عربی] *صفت*. پتەو؛ پەیت؛ گورخ؛ هێقم؛ پایەدار ‹قلعەی مستحکم: قەڵای پتەو›.

**مستحیل** / mostahîl/: [عربی] *صفت*. ١. نەکراو؛ دەستنەداو؛ نەشیاو؛ نەڕەخساو؛ ئەستەم ٢. تەواوەوە؛ تاویاگەوە؛ ئەوەتاویا ٣. گۆڕاو؛ گۆڕدراو؛ داگەڕاو؛ واڕیا ٤. *[مجازی]* لە بەین چووگ؛ فەوتاو؛ فەوتیاگ؛ بنەبڕ؛ نابوود؛ بالمیش؛ کلێس.

**مستخدم** / mostaxdem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] /*سم*. کارکەر: ١. خزمەتکار؛ کارەکەر؛ بەردەست؛ پێشخزمەت؛ ڕاژەکار ‹مستخدم آمد و در را باز کرد: خزمەتکارەکە هات و دەرگای کردەوە› ٢. *[قدیمی]* کارمەند؛ کارگێڕ؛ بەکارگیراو ‹مستخدم دولت: کارمەندی دەوڵەت›.

**مستخرج**/ mostaxrac/: [عربی] *صفت*. دەرهێنراو؛ دەراوریاگ؛ بەرئاردە؛ هەڵێنجراو؛ دەرهاتە.

**مستخلص** / mostaxlas/: [عربی] *صفت*. ڕەها؛ ڕزگار؛ داخەلسیو؛ خەلسیو؛ ئازاد؛ ڕایی؛ بەردراو؛ وەردریا.

**مستدام** / mostadām/: [عربی] *صفت*. بەردەوام؛ پایەدار؛ هەمیشەیی؛ نەبڕاوە؛ هەرماو ‹سایەی عالی مستدام: سایەتان بەردەوام›.

**مستدعی** / mostad'î/: [عربی] *صفت*. داواکار؛ خوازیار؛ تکاکار ‹مستدعی است مقرر فرمایید به کار ما رسیدگی شود: داواکارم بفەرموون بە کاری ئێمە ڕابگەن›.

**مستدعیات** / mostad'îy(y)āt/: [عربی] /*سم*. داخواز؛ خوازە؛ تکا؛ خوایشت؛ داواکاری.

**مستدل** / mostadal(l)/: [عربی] *صفت*. بەڵگەدار؛ بە بەڵگە: ١. وێڕای بەڵگە ‹توضیح مستدل: شرۆڤەی بەڵگەدار› ٢. شیاوی سەلمانن بە هۆی بەڵگە هێنانەوە ‹اتهام مستدل: گزنی بە بەڵگە›.

**مستدیر** / mostadîr/: [عربی] *صفت*. جەغزئاسا؛ بازنەواش؛ بازنەیی؛ جەغزی؛ بە وێنەی جەغز.

**مستر** / mester ، ـها/: [انگلیسی] /*سم*. سەرناوی بانگ‌کردن بۆ پیاوانی بیانی بەتایبەت ئینگلیسی زمان، بە مانای ئاغە؛ کاکە.

**مستراح** / mostarāh ، ـها/: [عربی] /*سم*. ئاودەست؛ ئابدەست؛ ئاڤدەست؛ دەستاو؛ ئاودەس؛ ئاوخانە؛ ئەدەبخانە؛ ئاودەسخانە؛ پێشاو؛ کناراو؛ پەراو؛ ئابخانە؛ ماشاخانە؛ سەراو؛ مستەراو؛ مستراو؛ سەرپێشاو؛ ئافدۆنگ؛ ئافرێژ؛ چۆلک؛ مامشخانە؛ کەنەف؛ کەنەفە؛ دەس‌شۆری؛ مبال؛ مەبال؛ مەوال؛ دیوێک بە لەگانی تایبەت یان لە سەر چاڵاو بۆ میز کردن و ڕیان: **مَبال؛ مَبرَز**

**مسترد** / mostarad/: [عربی] *صفت*. وەرگەڕاو؛ ڤەدراوە؛ دراوە؛ ئەوەدریا ‹پول بە صاحبش مسترد شد: پارەکە وەگەڕایەوە دەستی خاوەنی›.

**مستزاد** / mostazād/: [عربی] /*سم*. *[ادبی]* چەشنێک هۆنراوە کە بە شوێن هەر باڵێکدا کورتەڕستە یان چەند وشە هاتووە کە لە باری ماناوە جوان دێتەوە بەڵام لەباری کێشەوە زیادیە (وەک ئەم شیعرەی «نالی»:

«ئەی تازە جەوان پیرم و ئوفتادە و کەوتووم// تا ماوە حەیاتم / دەستێ بدەرە دەستی شکستەم کە لە دەس چووم// قوربانی وەفاتم»).

**مستشار** / mostašār ، ـها؛ ـان/: [عربی] /*سم*. ١. ڕاوێژکار؛ ڕاوێژیار؛ ڕاوێژەر؛ تەگبیرکەر ٢. کارناس؛ پسپۆڕ (بەتایبەت لە وڵاتێکی‌ترەوە).

**مستشرق** / mostašreq ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] /*سم*. ڕۆژهەڵاتناس؛ ڕۆژەڵاتناس؛ خۆرهەڵاتناس.

**مستضعف** / mostaz'af ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. هەژار؛ فەقیر؛ نەدار؛ دەستەنگ؛ دەسکورت؛ کەمدەس؛ ژار ‹طبقەی مستضعف: چینی هەژار›.

**مستطاب** / mostatāb/: [عربی] *صفت*. پاک و پوار؛ خاوێن (ڕاڤە: سەرناوێکی بەڕێزانە بۆ بانگ کردنی کەسێ).

**مستطیع** / mostatî'/: [عربی] *صفت*. ماڵدار؛

پوولدار؛ دەستچوو؛ دەسچووگ؛ دارا؛ مایەوەر؛ زەنگین؛ دەولەمەند و مایەبۆش، بەتایبەت لە باری توانستی چوون بۆ حەجەوە.

**مستطیل** / mostatîl، ـها/: [عربی]/اسم. لاکێش؛ لاکێشە؛ تەشک؛ بیچمێکی تەختی ئەندازیاری چوارلاسک، کە لاسکەکانی بەرامبەر یەکسان و هاوشانن و هەر چوار سووچیشی ۹۰° یە.

هەروەها: **مربع مستطیل**

**مستطیلی** / mostatîlî/: [عربی] صفت. [گفتاری] تەشکی؛ لاکێشەیی؛ بە بیچمی لاکێشەوە.

**مستعار** / mosta'ār/: [عربی] صفت. ۱. [نامتداول] ئەمانەتی؛ ئامانەت؛ ئامانەتی؛ قەرزی؛ ئاریە ۲. هەڵبەستە؛ دروستکراو؛ دەسەڵبەست؛ دەرهێنراو ‹نام مستعار: ناوی هەڵبەستە›.

**مستعجل** / mosta'cel/: [عربی] صفت. [ادبی] ۱. تەمەنکورت؛ کەمتەمەن؛ کەمخایەن؛ زووتێپەڕ؛ زۆرپێنەچوو ‹دولت مستعجل: دەولەتی کەمتەمەن› ۲. [نامتداول] بەهەشتاو؛ بەپەلە؛ بەلەز؛ بلەز و بەز.

**مستعد** / mosta'ed(d)/: [عربی] صفت. لەبار: ۱. ـها؛ ـان/ هێزا؛ زیر و زۆڵ؛ لێهاتوو ‹جوان مستعد: لاوی هێژا› ۲. ئامادە؛ پەیت؛ ساز؛ شیاو؛ جێی چاوەڕوانی ‹سقف مستعد فروریختن بود: میچەکە ئامادەی ڕووخان بوو›.

**مستعفی** / mosta'fî، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. دەستهەڵگرتوو؛ دەسهەڵگرتگ؛ دەسکێشاو؛ دەسهەڵگەردە.

**مستعمرات** / mosta'merāt, mosta'marāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مستعمره**

**مستعمراتی** / mosta'merātî, mosta'marātî/: [عربی] صفت. ۱. داگیرکراوانە؛ سەر بە داگیرکراو ۲. داگیرکەرانە.

**مستعمره** / mosta'mere, mosta'mare، ـها؛ مستعمرات/: [عربی]/اسم. ۱. داگیرکراو؛ ژێردەسەلات؛ ولاتێ کە دەم و دەزگای سیاسی، ئابووری و فەرهەنگیەکەی لە لایەن دەولەتێکی بیانیەوە بەڕێوە دەچێ ۲. داگیرکراو؛ ژێردەسەلات؛ ولاتێ کە سەرچاوەکانی ئابووری، کار، بازاڕ و ماکی لە دەست دەولەتێکی بیانیدایە و ئەو کەلکی لێ وەردەگرێ ۳. پەنابەرنشین؛ کۆچبەرنشین؛ کۆچەرنشین.

**مستعمرەدار** / mosta'meredār, mosta'mare-، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. داگیرکار؛ داگیرکەر؛ خاوەن دەسەلات لە ولاتێکی تردا.

**مستعمرەنشین** / mosta'merenešîn, mosta'mare-، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. ژێردەسەلاتنشین؛ ئەوەی (پتر لاوەیی) کە لە ولاتێکی داگیرکراودا دەژی. هەروەها: **مستعمرەنشینی**

**مستعمل** / mosta'mal/: [عربی] صفت. ۱. ـها/ دەکارکراو؛ نیمداشت؛ کۆن؛ کۆنە؛ بەکارهێنراو؛ کارپێکراو؛ کارنیای؛ دەکارکریاگ؛ کارکردە ۲. [نامتداول] بەبرەو؛ باو.

**مستغرق** / mostaqraq/: [عربی] صفت. ۱. خنکاو؛ نوقوم؛ نقوو؛ نقۆ؛ نقم؛ نقوم؛ نخرۆ؛ ڕۆچووگ؛ قومبوو ۲. [کنایی] تایبەتمەندی کەسێ کە نوقمی کارێک بووە و شەو و ڕۆژ ناناسێ.

**مستغل** / mostaqal(l)، ـات/: [عربی]/اسم. ملکێ کە داهاتی هەبێ (وەک باخ، دووکان، مالی کرێ و...).

**مستغلاتی** / mostaqal(l)ātî/: [عربی] صفت. ۱. تایبەتمەندی مال و ملکێ کە داهاتی هەبێ ۲. بونگا؛ دەفتەری سەندن و فرۆشتنی ملک و مال.

**مستغنی** / mostaqnî/: [عربی] صفت. بێنیاز؛ بێئاتاجی.

**مستفاد** / mostafād/: [عربی] صفت.. وەرگیراو؛ وەدەستهاتوو؛ حاسل.

⊡ **مستفاد** شدن: تێگەیشتن؛ وەرگیردران؛ وەرگیران؛ زانران؛ لێ حالی بوون؛

لێ تێگەیشتن ‹از این جمله چنین مستفاد می‌شود: لەم ڕستەیە ئاوا تێدەگەین›.

**مستفعلن** / mostaf'elon/: [عربی]/اسم. [ادبی] موستەفعیلون؛ لە کۆڵەکەکانی کێشی شیعری عەرووزی.

**مستفید** / mostafîd/: [عربی] صفت. بەهرەمەند؛ بەهرەوەر؛ قازانجبەر؛ کەڵکبەر؛ کەڵکوەر؛ بەشدار؛ بەهرەدار: مُستفیض

**مستفیض** / mostafîz/: [عربی] ☜ مستفید

**مستقبل** / mostaqbal/: [عربی]/اسم. [دستور] داهاتوو؛ کاتی نەهاتوو.

**مستقبل** / mostaqbel، ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. پێشوازگەر؛ پێشوازی‌کەر؛ بەرەو پیری چوو؛ بە پیریەوە چووگ.

**مستقر** / mostaqar(r)/: [عربی] صفت. جێ گرتوو؛ جێگر؛ جێگیر؛ بنەگر؛ دامەزراو؛ دامەرزیای؛ ئەرەمەرزیا؛ بە دۆخ یان حاڵەتی جێگیر بوون یان دامەزران ‹اعضای هیأت رییسه در جایگاه خود مستقر شدند: ئەندامانی دەستەی سەرۆکایەتی لە جێگای خۆیاندا جێگر بوون›.

**مستقل**[1] / mostaqel(l)/: [عربی] صفت. سەرخۆ؛ سەربەخۆ؛ ئازاد: ۱. بژیک؛ بژیو؛ خۆژی؛ خۆژیو؛ خاوەن دەسەڵات و سەربەخۆیی ۲. جیاواز؛ جیا؛ جویێ ۳. [سیاست] تایبەتمەندی حوکمەتێک کە بو بەڕێوە بردنی قانوون و لەباری ڕامیاری و ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە، چاو لە دەستی غەوارە نیە و بۆ خۆی بڕیاری خۆی دەدا.

**مستقل**[2]: قید. سەربەخۆ؛ سەرخۆ ‹او مستقل از دیگران عمل می‌کند: (ئەو) سەربەخۆ کار دەکا›.

**مستقلاً** / mostaqellan/: [عربی] قید. ۱. بە سەربەخۆیی؛ سەربەخۆیانە؛ بە ویست و مرازی خۆ ‹هر یک مستقلاً نظر خود را گفتند: هەر کام بە سەربەخۆیی بیرورای خۆیان دەربڕی› ۲. بە تەنیا؛ بەبێ یارمەتی یان دەست تێدابوونی کەسی‌تر.

**مستقیم** / mostaqîm/: [عربی] صفت. ۱. ڕاست؛ ڕاس؛ ڕێک؛ مەرتەبا؛ سەرڕاست؛ ڕاستەوڕاست ‹خط مستقیم: هێڵی ڕاست› ۲. ڕاستەوخۆ؛ بێ لادان و لە ڕێ دەرچوون ‹ارتباط مستقیم: پێوەندی ڕاستەوخۆ›.

**مستقیماً** / mostaqîman/: [عربی] قید. یەکڕاست؛ یەکڕاس؛ ڕێک؛ ڕاست؛ ڕاستەوخۆ؛ ڕاستەوڕاست؛ ڕاس‌وڕێک؛ بێ پێچوپەنا ‹مستقیماً به نوسود می‌روم: یەکڕاست دەچمە نەوسوو›.

**مستکبر** / mostakber, mostakbar، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. ۱. زۆرویژ؛ زۆرکار؛ هێز و بڕشت دەسکەوتوو بە چەوساندنەوەی خەڵک ۲. چەوسێنەر؛ بەهرەکێش.

**مستلزم** / mostalzem/: [عربی]/سم. پێویست؛ بە پێویست؛ شەرتی سەرەکی بۆ جێبەجێ بوونی کارێ، بەڕێوە چوونی بابەتێ یان گەیشتن بە ئامانجێک ‹موفقیت مستلزم تلاش است: سەرکەوتن پێویستی بە تێکۆشانە›.

**مستمر** / mostamer(r)/: [عربی] صفت. بەردەوام؛ درێژەدار؛ بێ‌پسانەوە؛ نەپس؛ سەرەمڕ؛ لە پەستا؛ لە سەریەک ‹برای موفقیت تلاش مستمر لازم است: بۆ سەرکەوتن هەوڵی بەردەوام پێویستە›.

**مستمراً** / mostamerran/: [عربی] قید. لە پەستا؛ پەساپەس؛ پەستاپەستا؛ بەردەوام؛ بێ‌بڕانەوە؛ سەرەمڕ؛ بەشێوەی درێژەدار و نەپساو ‹مستمراً از او خواسته می‌شد کە بدهی‌اش را بپردازد: لە پەستا داوای لێ دەکرا قەرزەکانی بداتەوە›.

**مستمری** / mostamerrî/: [عربی]/اسم. جیرە؛ بەراتی؛ برانە: ۱. مووچەیەک کە دەوڵەت بە بنەماڵەی کارمەندی لە دنیا دەرچووی دەدا ۲. چەشنێک پارەی مانگانە کە بە مەبەستی یارمەتی ژیانی وەرگران، بەبێ هیچ چاوەڕوانیەک پێیان دەدرێت.

**مستمری‌بگیر** / mostamerrîbegîr، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. مووچەخۆر؛ جیرەخۆر.

**مستمسک** / mostamsak, mostamsek، ـها/:

[عربی]/اسم. دەساوێز؛ دەستاوێز؛ بیانک؛ بیانوو؛ بەهانە؛ مهانە؛ بەهانێ.

▣ مستمسک قرار دادن: کردنە بیانوو/ بیانک؛ کەردە بەهانەی ‹بیماری را مستمسک قرار داد و یک ماه به سر کار نیامد: نەخۆشی کردە بیانوو، مانگێ نەهاتە سەر کار›.

**مستمع** / mostame' ، ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. گوێدەر؛ گۆهدار؛ گۆهگر؛ گوێگر؛ بیسەر.

**مستمع آزاد** / mostame'āzād ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. گوێگری ئازاد؛ بەشداری ئازاد؛ ئەوەی بە ویستی خۆی لە کلاس و دانیشتنێکدا ئامادە دەبێ، بێ‌ئەوەی لە باس و ئەزموونەکانیدا بەشداری بکا.

**مستملکات** / mostamlakāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مستملکه**

**مستملکه** / mostamlake ، ـها؛ مستملکات/: [عربی] /اسم. ژێردەست؛ ولاتێک وا لە سیاسەتی دەرەوەیدا سەربەخۆ نیە و شوێنەڕای دەوڵەتێکی ترە.

**مستمند** / most(a)mand ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. بڕەش؛ دەستەنگ؛ ژار؛ هەژار؛ دەسکورت؛ بێ‌ئەنوا؛ بێ‌ماڵ‌وحاڵ؛ بەرڤاڵە؛ نەدار؛ بارکەوتوو.

**مستند** / mostanad ، ـات/: [عربی] صفت. بەڵگەدار؛ بەڵگەوەر: ۱. بە بەڵگە؛ پاژدار؛ پڕنۆمەند ‹ادعای او مستند است: خوازەکەی بە بەڵگەیە› ۲. تایبەتمەندی فیلمێک کە لە ڕووداوی ڕاستەقینە پێکهاتووە.

**مستندات** / mostanadāt/: [عربی]/اسم. سەرجەم ئەو شتانەی بەڵگەیان هەیە یان بۆیان دەبێ.

**مستندسازی** / mostanadsāzî/: [عربی/ فارسی] /اسم. ۱. کاری دۆزینەوە و پێوەنانی بەڵگە بە دەق یان نووسراوەیەکەوە ۲. کاری دروست کردنی فیلمی بەڵگەوەر.

**مستنطق** / mostanteq ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. [قدیمی] بازپرس؛ ڤەپرس؛ ئەوەپەرس.

**مستنیر** / mostanîr/: [عربی] صفت. [ادبی] نوورگر؛ ڕووناکی‌گر؛ بەرتیشک؛ ڕۆناهی‌گر لە شتێکی ترەوە.

**مستوجب** / mostowceb, mosto:ceb/: [عربی] صفت. شیاو؛ دەرخۆر؛ لەبار؛ سزاوار ‹او به علت جوانی و حسن سابقه مستوجب عفو است: لە بەر لاوی و پێشینەی باشی شیاوی بەخشینە›.

**مستور** / mastûr ، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. [ادبی] داپۆشراو؛ پۆشراو؛ داشاراو؛ داشاریاگ؛ ڤەشارتی؛ پۆژیا.

**مستوره** / mastûre/: [؟] ☜ **مسطوره**

**مستوری** / mastûrî/: [عربی]/اسم. [ادبی] داپۆشراوی؛ داشاریاگی؛ پۆژیایی.

**مستوفی** / mostowfî, mosto:fî ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. [قدیمی] کەسێ کە لە ڕێکخراوە دەوڵەتیەکاندا بە سەر کار و باری ماڵی و دەفتەر و بەڵگەدا ڕادەگەیشت.

**مستولی** / mostowlî, mosto:lî/: [عربی] صفت. زاڵ؛ چیر؛ چێر؛ دەس بە سەراگرتوو ‹ترس بر همه مستولی شد: ترس بە سەر هەمووواندا زاڵ بوو›.

**مستوی** / mostavî/: [عربی] صفت. [ادبی] تەخت؛ ساف؛ هامار؛ بێ‌کۆسپ؛ بێ‌کەند و کۆت؛ بێ‌کەند و لەند.

**مستهجن** / mostahcan/: [عربی] صفت. دزێو؛ ناحەز؛ نەچێ؛ ناشیرین؛ کەلەواژی؛ زشت؛ شەرمهێن ‹حرف مستهجن: قسەی دزێو›.

**مستهلک** / mostahlak/: [عربی] صفت. فەوتاو؛ نەماو؛ تەفر و توونا؛ فەوتیاگ؛ لە بەین چووگ.

▣ مستهلک شدن: ۱. تەواو بوون؛ نەمەنەی ‹بدهی شما در صد قسط مستهلک شد: قەرزەکەتان لە سەد بەشدا تەواو بوو› ۲. پێوە نەمان؛ کەل و کۆن بوون ‹این اتومبیل مستهلک شده است: ئەم ماشینە پێوە نەماوە›. هەروەها: **مستهلک کردن**

**مستی** / mastî/: اسم. مەستی؛ مەسی: ۱. دۆخی گۆڕان و تێکچوونی ئاوەز و لەش (وەک گەرم

داگەڕان، خێرا بوونەوەی هەڵسووڕانی خوێن، شادی، خەم و زیچی نائاسایی) بە هۆی خواردنەوەی ئەلکول و ماکی سرکەری‌تر (وەک زافەران، هەشیش و...) ٢. سەرمەستی؛ شایی و کەیفی درێژەدار؛ کەیفسازی ٣. *[مجازی]* بێ‌هەست و خوستی؛ بێ‌ئاگایی لە بار و دۆخی خۆ یان دەور و بەر.

**مستی‌آور** / mastî'āvar/: *صفت.* مەسکەر؛ مەستی‌هێن: **مستی‌بخش**

**مستی‌بخش** / mastîbaxš/ ☜ **مستی‌آور**

**مسجد** / masced ، ـها؛ مساجد/: [عربی]*/اسم.* مزگەوت؛ مزگت؛ مزێت؛ مزگەفت؛ نقێژگە؛ نوێژگە؛ مێژگە؛ نمینگە؛ مەچێ؛ پەرستنگای موسڵمانان، پتر وەکووماڵێکی سەرگیراو بە میحرابێک ڕوو لە کەعبە و گومەز و منارەوە.

◙ **مسجد** آدینه: *[ادبی]* مزگەوتی/ مزگت جامیعە.

**مسجد جامع/ جمعه**: مزگەوتی جامیعە؛ مزگەوتی گەورەی شار بۆ نوێژی جومعە.

**مسجع** / 'mosacca/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ئاهەنگین؛ تایبەتمەندی دەقێکی وێژەیی کە ناوەناوە وشەکانی لە باری کێش و پاشەڵەوە بە یەک بخۆن (وەک: ... ئەگەر لە پرسەی حوسەیندا چەند فرمیسکێک هەڵوەرێنی، ئاخوند لە خۆت نەتۆرێنی، لە پیتاک دان نەبوڵێنی ئەوا چەند کۆشکێک دەستێنی گشتی یاقووت و زمرووتە ...).

**مسجل** / mosaccal/: [عربی] *صفت.* یەکلا؛ بڕاوە؛ مسۆگەر؛ مسەوگەر ‹رفتن ما هم مسجل شد: ڕۆیشتنی ئێمەش یەکلا بۆوە›.

**مسح** / mash/: [عربی]*/اسم. [اسلام]* مەسح؛ یەکێک لە بەشەکانی دەسنوێژ بریتی لە دەستی تەڕ بە پێشە سەردا هێنان (شیعە پەنجەی پێش مەسح دەکا).

**مسحور** / mashûr/: [عربی] *صفت.* ١. جادوولێکراو؛ سیحرکراو ٢. سەرسووڕماو؛ واقوڕماو؛ دەسەلات لێ‌بڕاو بە هۆی کارتێکردنی دیاردەیەکی سەیر و سەمەرەوە. هەروەها: **مسحور شدن، مسحور کردن**

**مسخ** / masx/: [عربی]*/اسم.* ڕەوتی گۆڕان بەتایبەت بوون بە بوونەوەرێکی کەسن یان دزێو.

◙ مسخ کردن: گەمراندن؛ دزێوکردن؛ کرێت کرن؛ بەدتەشک‌کردن؛ وەک شتێکی خراو لێ کردن و لە قەوارە خستن.

**مسخر** / mosaxxar/: [عربی] *صفت. [ادبی]* داگیرکراو؛ ڕادەست؛ گیراو؛ ئەرەگیریا؛ دەست بە سەردا گیراو ‹ناحیەی مسخر: ناوچەی داگیرکراو›.

**مسخرگی** / masxaregî/: [عربی/ فارسی]*/اسم.* ١. تیزوتەزی؛ مەچەڵیەتی؛ تنازی؛ ترانەیی؛ تیتاڵی؛ ترانەبازی؛ دەگەل؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی گاڵتەجاڕ و ناڕاست بوون ‹مسخرگی این استدلالها همە را بە خندە واداشت: تیزوتەزی ئەم بەڵگانە هەمووی هێنایە پێکەنین› ٢. */ـها/* مەزاق؛ حەنەک؛ گاڵتە؛ شۆخی؛ تیتاڵ؛ تیز؛ لاقردی؛ تەوزە؛ گەمەوگەپ؛ گەپجاڕی؛ ئاکاری وێڕای پێکەنین و شۆخی، پتر بۆ کەیفخۆش‌کردنی خەڵک ‹ساعتها مسخرگی کردند و خندیدند: چەن ساعەت مەزاقیان کرد و پێکەنین›.

**مسخره**[1] / masxare/: [عربی]*/اسم.* تناز؛ گاڵتە؛ گاڵتەجاڕ؛ گەپجاڕ؛ تیز؛ زللە؛ هەلک؛ ڕنگ؛ مەسخەرە؛ پەسقەڵە؛ تەوس؛ قەشمەری؛ مەچەڵ؛ ترانە؛ هێلۆل؛ تیتاڵی؛ تەقز؛ تەوزە؛ ڕشقەن؛ ڕشخەن؛ ڕیشخەن؛ کار و ڕەوتی گەمە پێکردن و کردنە هۆی سەیر و پێکەنینی خەڵک. هەرووەها: **مسخره شدن، مسخره کردن**

**مسخره**[2]: *صفت.* ١. */ها؛ ـگان/* گاڵتەجاڕ؛ تیتاڵی؛ تیتاڵباز؛ تولەکی؛ کوک؛ خاوەن ئاکارێ کە دەبێتە هۆی پێکەنین و سەرگەرمی خەڵک ‹آدم مسخره: مرۆڤی گاڵتەجاڕ› ٢. پێکەنینی؛ پێکەنیندار؛ کەنیندار ‹کلاه مسخره: کڵاوی

پیکه‌نینی› ۳. گاڵته؛ سه‌رسه‌ری؛ نه‌مجد ‹کار مسخره: کاری گاڵته›.

**مسدس**[1] / mosaddas/: [عربی]/اسم. ۱. شه‌ش لا؛ شه‌ش گۆش ۲. [ادبی] جۆرێ شیعر که هه‌ر به‌ندێکی شه‌ش باڵه (وه‌ک ئه‌م شیعره‌ی «شامی»: «یه‌سه چوار ڕووژتر هه‌م زمسسانه// زوخاڵ نابووده هیزم گرانه// سه‌دای زێل و به‌م به‌فر و بارانه// چه‌قه‌ی دنان تیه‌ی چو مسگه‌رخانه// داش نانه‌وایی نیه‌که‌فیه‌ده‌دس// دوکتور موسه‌دق ته‌کلیفمان چه‌س؟»).

**مسدس**[2]: صفت. شه‌شه؛ شه‌ش ئه‌ندام؛ به شه‌ش کۆله‌که‌وه.

**مسدود** / masdûd/: [عربی] صفت. گیراو؛ گیریاگ؛ گیریا؛ گراو؛ به‌رگیراو؛ به‌سراو؛ به‌ستراو؛ به‌سیاگ؛ ڕتمی؛ گره‌وتا؛ بینیا ‹جاده‌ی مسدود: جاده‌ی به‌سراو›.

**مسرت** / maserrat, masarrat/: [عربی]/اسم. [ادبی] خۆشحاڵی؛ شادی؛ شایی؛ گه‌شی ‹دیدار شما موجب مسرت خاطر گردید: چاوپێکه‌وتنتان بوو به هۆی خۆشحاڵی›.

**مسرت‌انگیز** / maserrat'angîz, masarrat-/: [عربی/ فارسی] صفت. [ادبی] شادیهێن؛ شایی‌هێن؛ گه‌شکه‌ره‌وه؛ گیان‌گه‌شێن؛ خۆشحاڵ‌که‌ر ‹رویداد مسرت‌انگیز: ڕووداوی شادیهێن›.

**مسرت‌بخش** / maserratbaxš, masarrat-/: [عربی/ فارسی] صفت. [ادبی] شادی‌ده‌ر؛ گیان‌گه‌شێن؛ شادیهێن؛ شادیبه‌خش ‹خبر مسرت‌بخش: هه‌واڵی شادی‌ده‌ر›.

**مسرف** / mosref ، ـان/: [عربی] صفت. هه‌رزێنه‌ر؛ هه‌ڵه‌خه‌رج؛ ده‌سبا؛ ده‌سبڵاو.

**مسرور** / masrûr/: [عربی] صفت. [ادبی] شا؛ شاد؛ گه‌ش؛ خۆشحاڵ؛ وه‌شحاڵ ‹از شنیدن این خبر بسیار مسرور شدم: له بیستنی ئه‌و هه‌واڵه زۆر شا بوومه‌وه›.

**مسروقه** / masrûqe/: [عربی] صفت. دزراو؛ دزیاگ؛ دزیا؛ براو؛ بریا ‹مال مسروقه کشف شد: ماڵه دزراوه‌که دۆزرایه‌وه›.

**مسری** / mosrî/: [عربی] صفت. گیرۆ؛ قه‌گر: ۱. [پزشکی] درم؛ په‌تا؛ ئاهۆ ‹بیماری مسری: نه‌خۆشی درم› ۲. دۆخی له که‌سێکه‌وه تووشیاری که‌سی‌تر بوون ‹فساد اداری امروز یک بیماری مُسری شده است: ئه‌وڕۆکه گه‌نده‌ڵی بۆته نه‌خۆشیه‌کی گیرۆ›.

**مسطح** / mosattah/: [عربی] صفت. ۱. ته‌خت؛ گوڕ؛ هامار؛ بێ‌که‌ندوله‌ند ۲. [ریاضی] له سه‌ریه‌ک ڕووپه‌ڕ.

**مسطور** / mastûr/: [عربی] صفت. [نامتداول] نووسراو؛ نویسیا؛ نووسیاگ.

**مسطوره** / mastûre ، ـها/: [؟]/اسم. وێنه؛ ئه‌و به‌شه له کووتاڵ که به مه‌به‌ستی دیتن و داوا کردنی کڕیاران ڕاده‌نرێت: **مستوره**

**مسعود** / mas'ûd/: [عربی] صفت. پیرۆز؛ مباره‌ک؛ مواره‌ک؛ هه‌زه‌خ؛ هه‌زه‌ک ‹عید میلاد مسعود پیامبر: جێژنی پیرۆزی له دایک بوونی پێغه‌مبه‌ر›.

**مسقطی** / masqatî/: [عربی]/اسم. مه‌سقه‌تی؛ مه‌شکه‌فی؛ جۆرێ شیرینی له نیشاسته و شه‌کر و ماکی بۆنخۆش.

**مسقف** / mosaqqaf/: [عربی] صفت. سه‌رگیراو؛ سه‌رمیچدار؛ میچدار؛ به میچ؛ داپۆشراو؛ سه‌رپۆشراو؛ کۆسه‌ردار؛ سه‌رگیریا ‹فضای مسقف: شوێنی سه‌رگیراو›.

**مسکر** / mosker ، ـات/: [عربی] صفت. مه‌ستکه‌ر؛ مه‌سکه‌ر؛ سه‌رخۆشکه‌ر ‹شراب ماده‌ای مسکر است: شه‌راو ماکێکی مه‌ستکه‌ره›.

**مسکن** / maskan ، ـها؛ مساکن/: [عربی]/اسم. ماڵ؛ ماڵ؛ هێور؛ ئه‌نوا؛ جێگه؛ کێ؛ که‌ی؛ کیه؛ ده‌مانه؛ جیوار؛ لۆر؛ خوانوو؛ خانی؛ خینی؛ خانوو؛ گێڵ؛ یانه؛ جێگه‌ی تێدا ژین ‹میلیون‌ها نفر از مسکن مناسب محرومند: ملیۆنان که‌س له ماڵێکی باش بێ‌به‌شن›.

▣ **مسکن گرفتن**: هێورین؛ نیشتەجێ بوون؛ نیشتەیرە؛ مەنزڵ گرتن؛ لە جێگایێکدا حەسانەوە بۆ ژیان ‹به کردستان رفت و در دهوک مسکن گرفت: چوو بۆ کوردستان و لە دهۆک نیشتەجێ بوو›.

**مسکن** / mosakken ، ـها/: [عربی] *صفت.* ژانبڕ؛ هەدادەر؛ سوکنایی‌دەر؛ ئارامبەخش؛ ئارامیدەر؛ هێورکەر؛ هێورێنەر؛ سرەوێنەر؛ بە تایبەتمەندی سرەواندنی ئێش و ئارامکردنەوە ‹قرص مسکن: حەبی ژانبڕ›.

**مسکنت** / maskanat/: [عربی] *اسم. [ادبی]* فەقیری؛ هەژاری؛ ژاری؛ بێ‌ئەنوایی؛ دەسکورتی؛ بێ‌دەسەلاتی؛ کەمدەسی؛ برەشی ‹دچار فقر و مسکنت شد: تووشی نەداری و هەژاری بوو›.

**مسکوت** / maskût/: [عربی] *صفت.* بێ‌دەنگ؛ بێ باس؛ سەرنراوە؛ بە تایبەتمەندی قسە لێوە نەکردن یا ڕاگرتن ‹این بحث را فعلاً مسکوت بگذارید: جارێک ئەم باسە بێ‌دەنگ بێلنەوە›.

▣ **مسکوت شدن**: شوێن نەگیران؛ وێڵ کردن؛ ڕاگیران؛ سەرنرانەوە.

**مسکوت ماندن**: ناتەواو مانەوە؛ ڕاوەستان؛ ڕاگیران؛ سەرنراو مانەوە؛ بە سەرنراوی مانەوە.

**مسکوک**[1] / maskûk ، ـات/: [عربی] *اسم.* سکە؛ دراوی کانزایی.

**مسکوک**[2]: *صفت.* سکەیی؛ دراوی؛ لێدراو؛ بە بیچم یان تایبەتمەندی سکەوە ‹طلای مسکوک: زێڕی سکەیی›.

**مسکون** / maskûn/: [عربی] *صفت.* ئاوەدان؛ ئاوا؛ ئاڤا: ۱. تێدا دانیشتوو ‹آن خانه مسکون نیست: ئەو ماڵە ئاوەدان نیە› ۲. شیاوی نیشتەجێ بوون ‹ مسکون ساختن آنجا کارهای زیادی لازم دارد: ئاوەدان کردنەوەی ئەوێ پێویستی بە کاری زۆرە›.

**مسکونی** / maskûnî/: [عربی] *صفت.* ئاوەدان؛ ئاوا؛ ئاڤا: ۱. شیاوی نیشتەجێ بوون ۲. تێدا نیشتەجێ ۳. بە شوێنی دانیشتن و تێدا ژیان ‹منطقەی مسکونی: ناوچەی ئاوەدان›.

**مسکین** / meskîn ، ـها؛ ـان؛ مساکین/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ژار؛ هەژار؛ بێ‌ئەنوا؛ بێچارە؛ داماو؛ کلۆڵ؛ بەلەنگاز؛ لێقەوماو؛ داماگ.

**مسگر** / mesgar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* مسگەر؛ قەزانچی؛ بەرۆش‌ساز؛ مزگەر؛ پاخرکەر؛ کەسێ کە کەرەسە و دەفر و دۆڵەی مسین چێ دەکا و سەر و کاری دەگەڵ قاپ و قاچاخی مسیدایە.

**مسگری** / mesgarî/: *اسم.* مسگەری؛ مزگەری: ۱. پیشەی مزگەر ۲. /ـها/ بەرۆش‌سازی؛ کارگەی مزگەر.

**مسلح** / mosallah/: [عربی] *صفت.* ۱. چەکدار؛ بەچەک؛ خاوەن ئەسپابی شەڕ ‹نیروی مسلح: هێزی چەکدار› ۲. پرچەک؛ چارچەک؛ خاوەن ئامراز، کەرەسە و لێهاتوویی ‹مسلح به سلاح علم و تقوا: چارچەک بە چەکی زانست و پارێزگاری›.

**مسلحانه**[1] / mosallahāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* چەکدارانە؛ بە کەڵکوەرگری لە چەک ‹جنگ مسلحانه: شەڕی چەکدارانە›.

**مسلحانه**[2]: *قید.* چەکدارانە؛ بە چەکەوە؛ بە کەڵک وەرگرتن لە چەک ‹مسلحانه به بانک حمله کردند: چەکدارانە هەڵماتیان برد بۆ بانک›.

**مسلخ** / maslax ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* کوشتارگە؛ کوشتارخانە؛ جێگای کوشت و بڕ.

**مسلسل**[1] / mosalsal ، ـها/: [عربی] *اسم.* شەستیر؛ شێستیر؛ ڕەشاش؛ ڕەشاشە؛ موسەلسەل؛ ئاگربار؛ تیربار؛ مەترەلۆز؛ مەترەلویز؛ ڕێژنگ؛ جۆرێ ئامرازی شەڕی گەرم کە زۆر فیشەک بە ڕیز دەهاوێ.

**مسلسل**[2]: *صفت. [نامتداول]* زنجیرئاسا؛ زەنجیرەیی؛ بە شوێن یەک؛ لە دوای یەک.

**مسلسل**[3]: *قید. [نامتداول]* لە سەر یەک؛ لەپەستا؛ نەپس؛ لێکدا ـ لێکدا؛ پەستا ـ پەستا؛ پەسا ـ پەسا؛ پەیتا ـ پەیتا؛ هەیتە ـ هەیتە؛ هەیتا ـ هەیتا؛ هەژدەر ـ هەژدەر؛ بێ پەستانەوە؛ بێ وچان؛

یەکسەرە ‹مسلسل حرف می‌زد: لە سەریەک قسەی دەکرد›: **مُسلسل‌وار**

**مسلسل وار** / mosalsalvār/: [عربی/ فارسی] ☜ **مسلسل**³

**مسلط** / mosallat/: [عربی] *صفت.* زاڵ؛ چێر؛ چیر؛ سوار؛ بە دەستەڵات ‹بە کار مسلط شد: بە سەر کارەکەدا زاڵ بوو ›.

**مسلک** / maslak ، ـها/: [عربی]/*اسم.* دۆز؛ ڕێباز؛ ڕێبیر؛ ڕێ؛ مەرام؛ بنەمای بیر و بڕوا کە ئاکار و هەڵسوکەوتی کەس یان تاقمێک لەگەڵ خەڵک و دیاردەکاندا ڕوون دەکاتەوە ‹تملق در مسلک او نیست: زمانلووسی لە دۆزیدا نیە›.

**مسلکی** / maslakî/: [عربی] *صفت.* دۆزی؛ ڕێبیری؛ ڕێبازی؛ سەر بە دۆز و ڕێبازەوە.

**مسلم** / mosallam/: [عربی] *صفت.* ۱. بێ شک؛ بێ‌قسە و باس؛ دەستەبەر؛ مسۆگەر؛ مسەوگەر ‹پیروزی ما مسلّم است: سەرکەوتنی ئێمە بێ‌شکە› ۲. /ـات/ وەرگیراو؛ بڕاوە؛ پەژیراو ‹اصل مسلّم: بنەمای وەرگیراو›. هەروەها: **مسلم بودن؛ مسلم شدن؛ مسلم کردن**

**مسلم** / moslem ، ـین/: [عربی]/*اسم.* مسڵمان؛ موسوڵمان؛ کەسێ کە لە سەر دینی ئیسلامە.

**مسلماً** / mosallaman/: [عربی] *قید.* بێ‌گومان؛ بێ‌سۆ؛ بەبێ شەک؛ حەتمەن؛ حەتم ‹مسلماً شما از آمدن او خبر داشتید: بێ‌گومان ئێوە لە هاتنی ئەو ئاگادار بوون›.

**مسلمان** / mosalmān ، ـها؛ ـان/: [از عربی]/*اسم.* موسوڵمان؛ مسڵمان؛ هەر یەکە لە شوێنکەوتووانی دینی ئیسلام.

**مسلمانی** / mosalmānî/: [از عربی]/*اسم.* موسوڵمانەتی؛ مسڵمانی؛ دۆخی موسڵمان بوون.

**مسلوب** / maslûb/: [عربی] *صفت.* *[نامتداول]* لێوەرگیراو؛ لێ‌سەندراو؛ لێ گیراو.

**مسلول** / maslûl ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.* وەرەمی؛ سیلدار؛ سیار؛ سیلاوی؛ دیقاوی؛ تووشی نەخۆشی دەردەباریکە.

**مسله** / mesalle/: [؟] ☜ **میل-۳**

**مسما**¹ / mosammā/: [از عربی ؟]/*اسم.* موسەمما؛ پێخۆرێ کە بە گۆشت و باینجان یان کوولەکەی سوورەوەکراو دروست دەکرێ.

**مسما**²: [عربی] *صفت.* ۱. ناونراو؛ ناونریاگ ۲. خاوەنی ناو ۳. ڕواڵەتی؛ هەر بۆ بەرچاو و بەبێ کاکڵ * **مسمّی**

◘ **اسم بی‌مسما** ☜ **اسم**

**مسمط** / mosammat ، ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم.* *[ادبی]* هۆنراوەیەک بە چەند بەندەوە کە باڵەکانی هەر بەندێک پێکەوە و باڵی ئاخر دەگەڵ باڵی ئاخری بەندکانی‌تردا هاوپاشڵن (وەک پارچەهەڵبەستی بەناوبانگی «کرانشینی» شامی کرماشانی).

**مسموع** / masmû' ، ـات/: [عربی] *صفت.* بۆ بیستن؛ بیستنی؛ شیاوی بیستن؛ ژنەفتنی ‹دلیلهای شما مسموع نیست: بەڵگەکانی ئێوە بۆ بیستن نابن›.

**مسموم** / masmûm/: [عربی] *صفت.* ژاراوی؛ ژەهراوی؛ سەمە: ۱. تێکەڵ بە ژار ‹غذای مسموم: چێشتی ژاراوی› ۲. /ـها؛ ـان؛ ـین/ *[مجازی]* وەبەر شتێکی خراپ و ناخۆشدا بوون ‹فضای مسموم: هەوای ژاراوی›.

◘ **مسموم کردن:** ۱. ژاراوی‌کردن؛ ژەهراوی کردن؛ سەمە کردن؛ تێکەڵ بە ژارکردن ‹آب را مسموم کرده بودند: ئاوەکەیان ژاراوی کردبوو› ۲. دەرمانخۆر/ دەرمانخوار/ دەرمانخوارد کردن؛ ژار پێدان؛ دەرمان دان؛ ژارخۆرکردن ‹سگ را مسموم کرده بودند: سەگەکەیان دەرمانخۆر کردبوو› ۳. *[مجازی]* تێکدان؛ شێواندن؛ ناخۆش کردن ‹روابط ما را مسموم کرده‌اند: نێوانمانیان تێکداوە›. هەروەها: **مسموم شدن**

**مسمومیت** / masmûmîyyat، ـها/: [عربی]/اسم. مەسموومیەت؛ بار و دۆخی سەرلێداو بە هۆی خواردن و تێرۆچوونی ژار بۆ ناو لەش ‹بە دلیل خوردن غذای فاسد دچار مسمومیّت شده است: بە هۆی خواردنی چێشتی گەندەڵەوە تووشی مەسموومیەت بووە›.

**مسمی** / mosammā/: [عربی] ☜ **مُسَمّا**[2]

**مسن** / mosen(n)، ـها/: [عربی] صفت. بەساڵاچوو؛ بە عومر؛ بە تەمەن؛ تەمەندار؛ کۆنساڵ؛ ئیختیار؛ کاڵ؛ دانساڵ؛ دان؛ پیر ‹پدرم مسن است و نمی‌تواند پله‌ها را بالا برود: باوکم بەساڵاچووە و ناتوانێ لە پلیکانەکانەوە بچێتە سەر›.

**مسند** / masnad، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. جێگای دانیشتن (وەکوو تەخت، سەندەڵی و...) ۲. پلە و پایە؛ پێگە ‹مسند وزارت: پلەوپایەی وەزارەت›.

**مسنَد** / mosnad، ـها/: [عربی]/اسم. *[دستور]* گوزارە؛ هەواڵی «نیهاد» لە ڕستەدا (وەک «گەورە» لە ڕستەی «خوا گەورەیە»دا).

**مسندالیه** / mosnadol'elayh، ـها/: [عربی]/اسم. *[دستور]* نیهاد؛ کەس یان شتێ لە ڕستەدا کە کار، چۆنیەتی یان ناوێک دەدرێتە پاڵیەوە (وەک «خوا»، لە ڕستەی «خوا گەورەیە»دا).

**مسوار** / mesvār/:/اسم. مسوار؛ ئالیاژێک لە مس و قەلا بە ڕەنگی سووری ئاماڵ زەرد و بریکەدار کە لە ڕابردوودا بۆ چێکرنی سەماوەر و دەفری چێشتخانە کەڵکیان لێ وەردەگرت.

**مسواک** / mesvāk، ـها/: [عربی]/اسم. مسواک؛ میسواک؛ بڕۆسێکی تایبەتی بۆ ددان شۆردن.

⊡ **مسواک زدن/ کردن**: مسواک دان؛ میسواک لێدان؛ شتنی ددان بە مسواک ‹روزی سه بار دندانهایش را مسواک می‌زند: ڕۆژێ سێ جار ددانەکانی مسواک ئەدا›.

**مسوده** / mosavvadde, mosvadde، ـها/: [عربی]/اسم. ڕەشنووس؛ چلکنووس.

**مسهل** / moshel، ـها/: [عربی] صفت. ڤزۆکەر؛ کارکون؛ ڕەوانکەر؛ تایبەتمەندی خۆراک یان دەرمانێ کە ڕیخۆڵە بخاتە جووڵە و پاکی بکاتەوە.

**مسی** / mesî/: صفت. مسی: ۱. مسین؛ چێکراو لە مس ۲. بە ڕەنگی سووری ئاماڵ زەرد و بریکەدار.

**مسیحایی** / masîhāyî/: [معرب/ فارسی] صفت. ۱. سەبارەت بە حەزرەتی مەسیح(س) ۲. پاک؛ خاوێن؛ بێخەوش.

**مسیحی** / masîhî/: [عربی]/اسم. خاچپەرست؛ فەلە؛ فلە؛ فەلا؛ مەسیحی؛ دیان؛ خرستیان؛ عیسایی: ۱. /ـها؛ ـان/ شوێنکەوتووی ئایینی حەزرەتی عیسا(س) ‹مرد مسیحی: پیاوی خاچپەرست› ۲. سەر بە خاچپەرستی ‹کشورهای مسیحی: ولاتانی خاچپەرست›.

**مسیحیت** / masîhîyyat/: [عربی]/اسم. فەلاتی؛ خاچپەرستی؛ دینی مەسیح؛ دینی سەر بە حەزرەتی عیسا مەسیح(س) کە لە ئینجیلەکان و لە لایەن شاگردان و باوکانی کلیساوە ڕانراوە: **دین مسیح**

**مسیر** / masîr، ـها/: [عربی]/اسم. بگار؛ بوار؛ ویەر؛ دەرڕێ؛ ڕێگەی بگاردن ‹مسیر رودخانه؛ مسیر حرکت: بگاری چۆم؛ بواری بزووتن›.

**مسیل** / masîl، ـها/: [عربی]/اسم. خڕ؛ سێلگا؛ سێلاوگر؛ کەنداو؛ کەندەلان؛ سوورمایی؛ لافاوگا: ۱. بگاری لافاو ۲. مەرخێ کە تەنیا لە وەرزی باران یان لە کاتی لافاودا ئاوی هەیە.

**مسین** / mesîn/: صفت. *[ادبی]* مسی؛ مسین؛ لە مس دروستکراو؛ لە پاخر چێبوو.

**مسیو** / mos(i)yo، ـها/: [فرانسوی]/اسم. موسیۆ؛ مووسیۆ؛ سەرناوی پیاوانی بیانی، پتر بۆ فەرەنگیان و خاچپەرستان، بە مانای ئاغە: **موسیو**

**مش** / maš/:/اسم. *[مخفف]* مەشەیی؛ مەش؛ مەشتی؛ مەشهەدی ‹مش تقی: مەشەیی تەقی›.

**مش**[1] / meš/: [فرانسوی]/اسم. مش: ۱. بەرهەمێکی پیشەسازی بە ڕەنگی جۆراوجۆر

پتر ئیکلیلی بۆ ڕەنگ‌کردنی قژ ۲. جۆرێ ڕازاندنەوەی قژ کە بەشێک یان چەند چەپکی بە ڕەنگێکی‌تر ڕەنگ دەکەن.

**مش**[۲]: صفت. تایبەتمەندی قژێ کە چەن چەپکی بە ڕەنگێکی‌تر بەتایبەت زەرد کراوە.

⊡ **مش کردن:** مش‌کردن؛ بە دوو یا چەند ڕەنگ دەرهێنانی قژ.

**مشائی** / maš(š)āʹī/: [عربی] ☜ **مشایی**

**مشابه** / mošābeh/: [عربی] *صفت.* هاوشێوە؛ هاوتا؛ میناک؛ وەک‌یەک؛ پێسەو یۆی؛ مینا؛ لێکچوو؛ وێچوو؛ وێکچوو ‹این پیراهن مشابه آن یکی است که خریدی: ئەم کراسە هاوشیوەی ئەوەیە کڕیوتە›.

**مشابهت** / mošābehat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* وەک‌یەکی؛ وێکچوونی؛ هامتایی؛ نۆلانی؛ لێکچوویی؛ وێچوویی؛ میناکی؛ میناهی؛ هاوشێوەیی؛ دۆخی وەک یەک هاتنەوە لە ڕەنگ و بیچمدا.

**مشاجرات** / mošācerāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مشاجره**

**مشاجره** / mošācere ، ـها؛ مشاجرات/: [عربی]/*اسم.* شەڕە قسە؛ دەمەقڕە؛ دەمەقڕێ؛ دەمەقاڵە؛ دەمەقاڵێ؛ مەرشە؛ دندووکە؛ دەم‌بەدەمە؛ دەمەدەمە؛ شووڵک؛ چەقە؛ هەنەهەپسێ؛ وت‌وویژ بە توورەییەوە.

**مشارالیه** / mošāron'elayh/: [عربی] *ضمیر. [ادبی]* ناوبراو؛ نێوبراو؛ ناقبری؛ باسکراو؛ وەناوگوتراو؛ ناوبریاگ ‹مشارالیه از مدت‌ها پیش تحت تعقیب بود: ناوبراو لە مێژە بە شوێنیەوە بوون›.

**مشارالیها** / mošāron'elayhā/: [عربی] *ضمیر. [ادبی]* ناوبراو؛ نێوبراو؛ ناوبریاگ؛ ناقبری؛ باسکراو؛ ناو گوتراو؛ ژن یا کچی ناوبریاگ ‹مشارالیها خواهان طلاق است: نیوبراو دەیەوێ تەلاق بستێنێ›.

**مشارکت** / mošārekat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* بەشداری؛ هاوبەشی؛ شەریکی؛ هاودەستی؛ هاوکاری ‹او هم در این کار مشارکت دارد: ئەویش لەم کارەدا بەشداری هەیە›.

**مشاطه** / maššāte ، ـها؛ ـگان/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* شانەکار؛ بووک‌جوانکەر.

**مشاع** / mošā' ، ـات/: [عربی] *صفت.* ناوکۆ؛ بەش نەکراو؛ بە دوو یا چەن خاوەنەوە ‹مال مشاع: ماڵی ناوکۆ›.

**مشاعر** / mašā'er/: [عربی]/*اسم.* ۱. ئاوەز؛ بیر و هۆش ‹مشاعرش مختل شده است: ئاوەزی ئاڵۆز بووە› ۲. *[فقه]* داب و دەستوور (زۆرتر بۆ حەج).

**مشاعره** / mošā'ere ، ـها/: [عربی]/*اسم.* موشاعیرە؛ شیعر هێنانەوە؛ کێبەرکێی هۆنراوە خوێندنەوە، بەتایبەت لە بەر خوێندنی هۆنراوەگەلی یەک چەمک یان هێنانەوەی بەیتی وا کە بە ئاخر پیتی بەیتی پێشوو دەس پێ‌دەکا.

**مشاغل** / mašāqel/: [عربی]/*اسم.* ۱. جمعِ ☜ **مَشغله** ۲. جمعِ ☜ **شُغل**

**مشام** / mašām(m)/: [عربی]/*اسم.* لووت؛ لووتە؛ پت؛ کەپۆ؛ بێڤل؛ ئەندامی بۆن کردن.

⊡ **به مشام رسیدن:** بە لووتدا هاتن؛ بیستن؛ ژنەفتن؛ ئەولووت کەوتەی؛ دانە لووتدا؛ خواردنە لووتا؛ بۆنی شتێک هەست‌کردن ‹بوی تندی به مشامم رسید: بۆنێکی تیژم بە لووتدا هات›.

**مشاور** / mošāver ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/*اسم.* ڕاوێژیار؛ ڕاوێژەر؛ ڕاوێژکار؛ ڕاوێژکەر؛ تەگبیرکەر؛ ئەو کەسەی لەگەڵیدا ڕاوێژ دەکەن.

**مشاورات** / mošāverāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مشاوره**

**مشاوره** / mošāvere ، ـها؛ مشاورات/: [عربی]/*اسم.* ڕاوێژ؛ تەگبیر؛ شێوەر؛ مشوور؛ مسەور.

**مشاهد** / mašāhed/: [عربی] جمعِ ☜ **مَشهَد**

**مشاهدات** / mošāhedāt/: [عربی]/*اسم.* ۱. جمعِ ☜ **مشاهده** ۲. بینراوان؛ دیتراوان ‹مشاهدات خود را بیان کنید: بینراوەکانی خۆتان دەرببڕن›.

**مشاهده** / mošāhede ، ـها؛ مشاهدات/: چۆنیەتی

دیتن؛ بینین؛ بە چاو سەیرکردن.

▣ **مشاهده شدن:** بینـران؛ دیتـران؛ پیویـەی ‹در آنجا نوعی پستاندار مشاهده شد: لەوێدا چەشنێ گواندار بینرا›.

**مشاهده کردن:** دیتن؛ بینـین؛ دیـەی؛ سـەیر کردن ‹پیش از این چنین پستانداری مشاهده نکرده بودم: تاکوو ئێستە ئاوا گواندارێکم نەدیتبوو›.

**مشاهیر** / mašāhîr/: [عربی] جمعِ ☜ **مشهور**

**مشایخ** / mašāyex/: [عربی] جمعِ ☜ **شیخ**

**مشـایع** / 'mošāye، ـان؛ ـیـن/: [عربـی]/اسـم. بەڕێکەر؛ ڕوانەکەر.

**مشایعت** / mošāye'at/: [عربی]/اسم. کار و ڕەوتی بـەڕێ‌کـردن؛ ڕوانـەکردن: ۱. ڕێورەسمـی تـا مەودایەک ڕۆشتنی کەس یان کەسانێک لەگەڵ کەسێکدا کە بەرەو شوێنێ (پتر شـوێنێکی دوور) دەچێ ۲. کار و ڕەوتی بردنی تەرمی مـردوو بـۆ سەرقەبران و ناشتنی.

**مشـایی** / maš(š)āyî/: [عربـی] صفت. مەشـایی: ۱. /ـان/ هـۆگر و شـوێنکەوتووی ڕێوشـوێنی فەلسەفی ئەرەسـتوو، فەیلەسـووفی مەقـدوونی (۳۸٤ تا ۳۲۲ پ.ز.) ۲. سەر بە ڕێبازی فەلسەفی ئەرەستوو و شوێنکەوتوانی * **مشائی**

**مشئوم** / maš'ûm/: [عربـی] صفت. شووم؛ بێ‌فـەڕ؛ قەشقە؛ شوهێنەر؛ قۆشە؛ بەدفەڕ؛ جـووتقۆشـە؛ قەش؛ دۆبڕ؛ دوموهر؛ دوومۆر: **مَیشوُم**

**مشـبک** / mošabbak/: [عربـی] صـفت. تـۆڕی؛ تۆڕەکی: ۱. تۆڕدار ۲. چاوە- چاوە؛ کون-کـون؛ بە تەشکی تۆڕ.

**مشبک کاری** / mošabbak.kārî/: [عربی/ فارسـی] اسم. تۆڕکـاری؛ کـار و ڕەوتی دروستکـردنی کەلوپەلی تۆڕی، بەتایبـەت چـێ‌کـرنی تـۆڕی جوان و ڕازێنەر لە سەر چێو یان کانزا.

**مشـبه** / mošabbah/: [عربـی] صـفت. [دسـتور] شبهێنراو.

**مشـبه‌بـه** / mošabbahonbeh/: [عربـی] صـفت. [دستور] پێ شبهێنراو (لـە ڕسـتەی «گۆنـای وەک پەڕەی گوڵ وایـە»دا، «گۆنـا» شـبهێنراو (مشـبه) و «پەڕەی گوڵ» پێ شبهێنراوە).

**مشت** / mošt، ـها/: اسم. مشت؛ مست: ۱. گوڵم؛ نوچک؛ نونجـک؛ نوونجـگ؛ گـوڕمیچ؛ گـورمچ؛ گوڕمۆچ؛ گوڕمچە؛ فووت؛ مستەکۆڵە؛ گوڕمشت؛ پەنجەی لێکنراو؛ مشتی قووچاو ‹دستت را مشت کـن!: مشـت بگـره!› ۲. سـیخورمە؛ سـوخورمە؛ سخلمە؛ سقلمە؛ گۆمرچە؛ گۆرمچە؛ گورمشـت؛ گرمست؛ مستەکۆڵە؛ مشتەکوڵـە؛ کـۆڵ؛ دنـگ؛ گـوڕمیچ؛ گـوڕمچ؛ گورمێچـە؛ گولـم؛ گولـەمە؛ گوڕمشت ‹یک مشت زد به چانەام: مشـتێکی دا لـە چەناکەم› ۳. لاوێچ؛ لەوێچ؛ لاگوێل؛ لالۆچ؛ ویـچ؛ لاگوول؛ گوێل؛ گوێلم؛ ئەوەندە لە شـت کـە لـە چالایی نێوان لەپی دەست و قامکەکانـدا جێـی دەبێتـەوە ‹یـک مشـت بـرنج: لاوێچێـک بـرینج› ٤. وێچ؛ دوولەوێچ؛ دوولاگوێل؛ ئەوەندە لە شت کە لە چالایی نێـوان لـەپی دوو دەسـتدا جێـی ببێتەوە ٥. [مجازی] بـڕ؛ چەنـد؛ چـەن دانـە (بـۆ سووکایەتی پێ‌کردن) ‹یک مشت بیکاره بـە دنبـالش راه افتادند: برێک بەتاڵپا کەوتنە شوێنی›.

▣ **مشت بر سندان زدن/ کوبیدن:** [کنـایی] ئاسنی سارد کوتان؛ ڕەقەن کێڵ‌کردن؛ کـاری دژوار و بێ‌کەڵک کردن ‹تو زورت به او نمی‌رسد، درافتادن با او مشت بر سندان زدن است: تـۆ دەرقـەتی ئـەو نایەیی، ئاوقا بوونی ڕەقەن کێل کردنە›.

**مشـت زدن:** مشـت/ مسـت لێـدان؛ مشـت داونـەی؛ سـوخورمە دان؛ مشـت/ گورمچـە وەشانن؛ گۆرمیچ داین؛ فووت شـەنن؛ فـووت خستن؛ بە پەنجەی قووچاو لە شتێک دان.

**مشت کردن:** مشت گرتن/ بەسـتن؛ نـاو لـەپ پڕکردنەوە و بە شێوەی مشت دەرهێنان.

**مشت کسی را باز کـردن:** [کنـایی] ۱. نهـێنی کەسێک ئاشـکرا کـردن ۲. فـێڵ و فـەرەجی کەسێ دەرخستن. هەروەها: **مشت خود را باز**

کردن؛ مشت کسی باز شدن
توی/ در مشت داشتن: لـه مشـتا بـوون؛ لـه چنگدا بوون؛ ده مستدا بوون؛ مشتەنە بیـەی؛ ئەنەمشت بیەی؛ لە بەر دەستا بوون.

**مشتاق** / moštāq ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. تامەزرۆ؛ تامازرۆ؛ پاپا؛ ئارەزوومەن؛ بەتاسە؛ گز؛ بەعەزرەت و ئـاوات؛ یـان؛ ئاواتـەواز؛ ئاواتـەخواز؛ بینەکـەر؛ ئەلهاکـەر ‹خیلـی مشـتاق اسـت تـو را ببینـد: زۆر تامەزرۆی دیتنی تۆیە›. هەروەها: مشـتاق بـودن؛ مشتاق شدن؛ مشتاق کردن

**مشتبازی** / moštbāzî/ ☜ مشتزنی

**مشـتبه** / moštabeh/: [عربـی] صـفت. هەڵـەبوو؛ گومانهەڵگر؛ دۆخی تێدا هەڵەیەک ڕوودان.
▣ مشتبه شـدن: لـێ تێکچـوون؛ تووشـی هەڵـە بوون؛ کەوتنە هەڵە ‹مثل اینکه امر به تـو مشـتبه شده است: وا دیارە شتەکەت لێ تێکچووە›.
مشتبه کـردن: لـێ تێـک دان؛ تووشـی هەڵـە کردن؛ بە هەڵەدا خستن؛ خستنە هەڵـەوە ‹او را مشتبه کردەاند: لێیان تێک داوە›.

**مشترک** / moštarak/: [عربـی] صفت. هاوبـەش؛ ناوکۆ: ۱. دووکۆیی؛ بەشداری لەگەڵ کەس یان کەسـانێ لـە شـتێکدا ‹منـافع مشـترک: قـازانجی هاوبەش› ۲. /ـات/ سەر بە دوو یـان چـەن شـت ‹مـرز مشـترک: سـنووری هاوبـەش› ۳. [منطـق] تایبەتمەندی وشەیەک کە زیاتر لە یەک مانـای هەیە، وەک «شێر».

**مشترک** / moštarek ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی]/اسـم. هاوبەش؛ بەشدار؛ کەسێ یان دامەزراوەیەک کە بـە دانی پارەیـەکی دیـاریکراو خزمـەتی دامەزراوەیەکی گشتی پێ دەگا ‹مشترک روزنامـە: هاوبەشی ڕۆژنامە›.

**مشـترکاً** / moštarakan/: [عربـی] قیـد. پێکـەوە؛ وێکـڕا؛ پێـڕا؛ وێـڕا؛ هاوبـەش؛ هاوپشـک؛ بـە هاوبەشی؛ شەریکی؛ یـۆوە؛ هـامبـەش؛ دەگـەڵ یەکتر ‹مغازە را مشترکاً ادارە می کردند: دووکانەکەیان پێکەوە هەڵدەسووڕاند›.

**مشـــترکات** / moštarakāt/: [عربـــی]/اســـم. هاوبەشیگەل؛ ئەو شتانەی وا لە نێـوان دوو یـان چەند کەس یان تاقمدا وەکوو یەکـە ‹مشترکات فرهنگی: هاوبەشیگەلـی فەرهەنگی›.

**مشترک المنافع** / moštarakolmanāfe'/: [عربی] صـفت. هاوقـازانج؛ هاوسـوو؛ خـاوەن قـازانجی هاوبەش.

**مشـتری**[1] / moštarî/: [عربـی]/اسـم. مشـتەری؛ موشتەری: ۱. /ـها؛ ـان/ کڕیار؛ بسێن ‹بـا مشـتری درست رفتار کن!: لەگەڵ کڕیاردا ئاکارت جوان بـێ!› ۲. ئەو کەسـەی زۆرتـر بـە لای فرۆشـیارێکەوە سەودا دەکا ‹او مشتری ماست: ئـەو مشـتەریمانە› ۳. هـورمز؛ جوپیتـەر؛ بـەرجیس؛ گـەورەترین گـەڕۆکی کۆمەڵـەی ڕۆژ بـە دوازدە مـانگی چکۆڵـەوە کـە خولگەکـەی لـە نێـوان بـارام و کەیواندایە: بِرجیس

**مشـتری**[2]: صـفت. [مجـازی] کـڕیار؛ خوازیـار؛ مشتەری ‹اگر مشتری هستی برایت نگهـدارم: ئەگـەر کڕیاری تا بۆت دابنێم›.

**مشتری پسند** / moštarîpasand/: [عربـی/ فارسـی] صفت. کڕیارپەسەند؛ مشتەری پەسـەن؛ خـاوەنی بار و دۆخێکی بەردڵی کڕیاران.

**مشـــتریخـــرکن** / moštarîxarkon/: [عربـی/ فارسی] صفت. [تعریض] مشتەری تـۆپدەر؛ هـۆی هەڵخڕان و هەڵخلەتانی مشتەری ‹ظاهرش خیلی مشـتریخـرکـن اسـت: لـە ڕووەوە زۆر مشـتەری تۆپدەرە›.

**مشتزن** / moštzan ، ـها؛ ـان/: اسم. مسـتەوان؛ بوکسور.

**مشـتزنـی** / moštzanî/: اسم. مسـتانێ؛ شەڕەمست؛ مستەوانێ؛ مشـتەکۆلانێ؛ بـوکس؛ جۆرێک وەرزش کە هەر دوو لا تێدەکۆشـن بـە مست هاوملەکەیان بە زەویدا بدەن: مشتبازی

**مشـتعل** / mošta'el/: [عربـی] صفت. داگیرسـاو؛

داگرساو؛ داییساو؛ دایساو؛ داگیراو؛ هەڵگرساو؛ هەڵگیرساو؛ پێ؛ ڤێ؛ هەڵ؛ پەلۆخ؛ گرتێچوو؛ گرگرتوو؛ ئاگرگرتوو؛ ڕۆشن؛ ئاورگرتوو؛ ئەنەگیسا؛ هۆرگرا؛ گرگر ‹آتش مُشتعل: ئاگری داگیرساو›.

**مشتق** / moštaq(q)، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ۱. *[دستور]* دارڕژتە؛ وەرگرتە؛ دارێژاو؛ وشەیێ کە لە وشەیەکی ترەوە بەدیهاتبێ (وەک «نالە» لە «نالین») ۲. *[زبان‌شناسی]* وشەیەک وا لە پێشگر یا پاشگر خستنە سەر وشەیەکی تر دروست بووە (وەک «هەڵوێست»، «ئارەقچن») ۳. لێبووی؛ لێوەبوو؛ وەچ؛ بەچ؛ ئەوەی لە شتێ وەدیهاتبێ و ئێستا بۆ خۆی جیا بێ.

**مشتقات** / moštaqqāt/: [عربی]/اسم. بەرهەمگەل؛ ئەو شتانە وا لە ماکێکی سەرەکیەوە بەرهەم دێن ‹مشتقّات نفت: بەرهەمگەلی نەوت›.

**مشتلق** / moštoloq/: [ترکی]/اسم. *[گفتاری]* مزگێنی؛ مزگانی؛ مزانی؛ نزانی؛ مزگین؛ مژدە: ۱. خەبەری خۆش ۲. مژدانە؛ مژدانی؛ مژدیان؛ دەمخۆشانەی خەبەری خۆش.

**مشتمال** / mošt(o)māl/: /اسم. مشتومال: ۱. پەرخ؛ لەپماڵ؛ وەرژوو؛ وەرزلا؛ ساوا؛ شێلانی لەش بە لەپی دەست ۲. *[کنایی]* کوتەک؛ کاری لێدان.

▣ **مشتمال دادن:** مشتومال دان؛ شێلاندن؛ شێلان: ۱. لەپماڵ دان؛ پەرخاندن؛ شێلەی؛ بە دەست مالینی ئەندامانی لەش ۲. *[کنایی]* لێدان؛ داوەنەی؛ تاشاندن؛ کوتەک لێدان.

**مشتمالی** / moštmālî/: /اسم. مشتومال؛ لەپماڵ؛ پەرخ؛ وەرژو؛ کاری مشتومال دان.

**مشتمل** / moštamel/: [عربی] *صفت.* داگر؛ لەبەرگر؛ لەخۆگر.

▣ **مشتمل بر:** بریتی لە؛ بریەتی لە؛ داگری ‹این مقاله مشتمل بر چهار بخش است: ئەم وتارە بریتی لە چوار بەشە›.

**مشتوک** / moštûk، ـها/: [روسی]/اسم. ۱. بنک؛ ئاغزە؛ قونچک؛ قونچکە سیگار؛ قنکە سیگار؛ فیلتێر؛ پاڵوێنە و مقەبایەک لە بنی جگەرەدا بۆ گرتنی ژەحرەکەی ۲. دەمنە؛ باسک؛ مۆمەقەند؛ مۆدنە؛ دارجگەرە؛ دارسیار؛ دەمەسیار؛ دارجغارە؛ گرۆڤەرێکی هلۆلە جگەرەی پێوە دەنێن و دەیکێشن.

**مشته** / mošte، ـها/: /اسم. میساب؛ مستی؛ مشته: ۱. مشتۆ؛ چەرمەکۆ؛ ئامێرێکی قۆچکەی کانزایی کە چەرمی پێ دەکوتن ۲. گۆشکوتی دارینەی هەلاجی ۳. ئەوەی لە مشتدا جێ ببێتەوە.

**مشتی** / maštî/ ☜ **مشهدی[1]ـ۲**

**مشجر** / mošaccar/: [عربی] *صفت.* ۱. دارستان؛ دارسان؛ بەدار؛ چڕە ‹زمین مشجر: زەوینی دارستان› ۲. داردار؛ لەق‌وپۆدار؛ بە نەخشی لق و پۆی دار ‹شیشەی مشجر: شووشەی داردار›.

**مشحون** / mašhûn/: [عربی] *صفت. [ادبی]* پڕ؛ پەڕ؛ دارماڵ؛ تژە؛ تژی؛ تەژی؛ لیپان ‹با قلبی مشحون از امید و شادی به سویش شتافت: بە دڵێکی پڕ لە ئاوات و شادی بەرەولای چوو›.

**مشخص** / mošaxxas/: [عربی] *صفت.* دیار؛ خویا؛ شینبەر: ۱. شایانی ناسین ‹قیافەها مشخص نبود: قیافەکان دیار نەبوون› ۲. ئاشکرا؛ خویان؛ تیل ‹مشخص بود کە می خواهند او را ببرند: دیار بوو دەیانەویست بیبەن›.

**مشخصاً**/ mošaxxasan/: [عربی] *قید.* بە ڕاشکاوی؛ بە ئاشکرایی؛ ئاشکرا ‹مشخصا او را انتخاب کردند: بە ئاشکرایی ئەویان هەڵبژارد›.

**مشخصات** / mošaxxasāt/: [عربی]/اسم. ۱. جمعِ ☜ **مشخصّە** ۲. نیشانیگەل؛ سەرجەم ئەو نیشانی و زانیاریانەی کە دەبێتە هۆی دیاری‌کردن و ناسینەوە ‹چشمان سیاه، ابروان پرپشت، بینی عقابی و خال درشت در گوشەی لب، مشخصات چهرەی او را تشکیل می‌داد: چاوی ڕەش، برۆی پڕ، لووتی بەرانپۆز و خاڵێکی درشت لە پەنای

لێویدا، نیشانەکانی دەم و چاویان پێکدەهێنا›.

**مشخصه**[1] / mošaxxase ، ـها؛ مشخصات/: [عربی] /اسم. گەوشین؛ تایبەتمەندی.

**مشخصه**[2]: صفت. دیارده؛ دیارخەر؛ دیارکەر ‹علامت مشخصه: نیشانی دیارده›.

**مشدد** / mošaddad/: [عربی] صفت. دووپاتە؛ گیرەدار ‹در این واژه حرف دال مشدد است: لەم وشەیەدا پیتی دال دووپاتەیە›.

**مشدی** / mašdî/ [مخفف] ☜ **مشهدی**[1]_[2]

**مشرب** / mašrab ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. دەم و زمان؛ ڕاوێژ؛ تووزم؛ شێوەی هەڵسوکەوت و ئاکار ‹آدم خوش مشرب: بنیادەمی خۆش دەموزمان› ۲. ڕوانگە؛ بۆچوون ‹مشرب عرفانی: ڕوانگەی عرفانی›.

**مشربه** / mašrabe ، ـها/: [عربی]/اسم. تۆنگ؛ پارچ؛ پاچ؛ دەفری دەمهەراوی دەسکدار لە کانزا، پتر بۆ هەڵگرتنی ئاو و تراوی تر.

**مشرف** / mošarraf/: [عربی] صفت. سەربەرز؛ سەرفەراز؛ سەربڵند.

▣ **مشرف شدن**: سەربەرز بوون؛ چوون بۆ لای کەسێکی گەورە یان شوێنێکی پیرۆز.

**مشرف فرمودن**: سەربەرزکردن (لە هاتنی کەسێکی گەورەدا دەگوترێ) ‹خوش آمدید! مشرف فرمودید: بە خێر هاتن! سەربەرزتان کردین›.

**مشرف** / mošref/: [عربی] صفت. سوار؛ بە هەتەر ‹خانەی ما مشرف بر خیابان است: ماڵی مە بە سەر شەقامدا سوارە›.

**مشرق** / mašreq/: [عربی]/اسم. ڕۆژهەلات؛ ڕۆژەلات؛ خۆرهەلات؛ ڕۆهەلات؛ خۆرەلات؛ هۆرامان؛ خاور؛ خاوەر؛ هۆراسان؛ خۆرووەزان؛ هۆرگە: ۱. لای تاوهەلات ‹آسمان مشرق داشت روشن می‌شد: لای ڕۆژهەلاتی ئاسمان خەریک بوو ڕوون دەبوووەوە› ۲. خاوەرزەمین؛ وڵاتانی ڕۆژهەلات.

**مشرق زمین** / mašreqzamîn/: [عربی/ فارسی] /اسم. [مجازی] ڕۆژهەلات؛ خاوەرزەمین؛ بریتی لە ئاسیا و ئەفریقا.

**مشرقی** / mašreqî ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. ڕۆژهەلاتی؛ خۆرهەلاتی؛ هۆرگەیی.

**مشرك** / mošrek ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. چەنپەرەست؛ چەنتاپەرەست؛ بڕوادار بە زۆرتر لە یەک خودا.

**مشروب**[1] / mašrûb ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. خواردنەوە، بەتایبەت ئەلکولی ‹نشسته بود و داشت مشروب می خورد: دانیشتبوو و خەریکی خواردنەوە بوو›.

**مشروب**[2]: صفت. ۱. خواردن؛ خواردنەوە؛ خواردنەوەیی؛ شیاوی خواردنەوە ‹آب مشروب: ئاوی خواردن› ۲. تێرئاو؛ ئاودراو ‹زمین مشروب: زەوی تێرئاو›.

▣ **مشروب شدن**: ئاو خواردنەوە ‹زمین‌های گریزه از رودخانەی قشلاق مشروب می‌شود: زەوینەکانی گرێزە لە ڕووباری قشلاخ ئاو دەخۆنەوە›.

هەروەها: **مشروب کردن**

**مشروبخور** / mašrûbxor ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. مەیخۆرەوە؛ مەیخۆر؛ شەراوخۆر؛ ئەلکولی؛ هۆگری فڕکرنی خواردنەوەی ئەلکولی.

**مشروبخوری** / mašrûbxorî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. شەراوخۆری: ۱. بادەنۆشی؛ کاری مەی خواردنەوە؛ خواردنەوەی خواردنەوەگەلی ئەلکولی ۲. پیاڵە؛ پەیمانە؛ دەفری تایبەت بۆ خواردنەوەی مەی.

**مشروح** / mašrûh/: [عربی] صفت. تێر و تەسەل؛ چڕ و پڕ؛ بە شرۆڤە؛ شرۆڤەدار ‹او طی بیانات مشروح خود از متهم دفاع کرد: لە وتارێکی تێر و تەسەلدا لە سەر تاوانباری کردەوە›.

**مشروحاً** / mašrûhan/: [عربی] قید. بە تێر و تەسەلی؛ بە پاراوی؛ بە شرۆڤەوە ‹این واقعه مشروحاً گزارش می‌شود: ئەم ڕووداوە بە تێر و تەسەلی ڕادەگەینرێت›.

**مشــروط** / mašrût/: [عربـی] *صـفت.* بـەمـەرج؛ مەرجدار ‹پذیرش مشروط: وەرگرتنی بەمەرج›.

**مشروطه**[1] / mašrûte/: [عربی] ☜ **مَشروطیّت**

**مشــروطه**[2]: *صـفت.* مەشــرووتە؛ بــە ڕژیمــی مەشرووتەییەوە.

**مشــروطەخــواه** / mašrûtexāh ، ـان/: [عربـی/ فارسی] *صفت.* مەشرووتەخواز؛ هۆگری حکوومەتی مەشروتە.

**مشروطیت** / mašrûtîyyat/: [عربی] *اسم.* *[سیاسی]* چەشنێک ڕژیمی سیاسی کە دەستووری هەیە، نوێنەرانی خەڵک قانوون دادەنێن و دەوڵەت لـە ئاست خەڵـک و نوێنـەرانی خەڵـکدا بەرپرسـە: **حکومت مشروطه؛ مشروطه**

**مشــروع** / 'mašrû/: [عربـی] *صفت.* ١. شــەرعی؛ بەرامبەر بە شــەرع ٢. *[مجازی]* ڕەوا؛ ڕێپێـدراو ‹تقاضای مشروع: داخوازی ڕەوا›.

**مشروعیت** / mašrû'îyyat/: [عربی] *اسم.* ڕەوایـی؛ بەرامبــەری لەگــەڵ دەســتوور و ڕێ و شــوێنی شەرعدا.

**مشعر** / moš'er/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* ئاگاکـەرەوە؛ ڕاگەیێنەر ‹نامەاش مشعر بـود بـر اختلاف بـرادرم و همسرش: نامەکەی ڕاگەیێنەری ناکۆکی نێوان بـرا و براژنم بوو›.

**مشعشــع** / 'moša'ša/: [عربــی] *صــفت.* *[ادبــی]* ١. درەوشاو؛ درەخشان؛ درەوشان؛ برووسکەدار؛ بە تیشک و تاو؛ تیشکدار؛ ورشــەدار؛ گرشــەدار؛ درۆشن؛ بریقەدەر؛ شۆقدار ٢. زۆر باش؛ یەکجار چاک؛ فرە خاس.

**مشعشعانه** / moša'ša'āne/: [عربی/ فارسـی] *قید.* بـە تیشــک و تــاو؛ پرتیشــک؛ بــەتاو؛ پرشــنگدار؛ بەتریفە؛ بە شێوەی گرشەدار.

**مشــعل** / maš'al ، ـهـا/: [عربــی] *اسـم.* شۆڵــە؛ ڕەشنەی؛ مەشخەڵ: ١. قوتیلە؛ پیسـۆز؛ چـرای ساکاری دەستهەڵگر، بـە پیاڵـەیەکی قـووڵ و پاچکەی باریک و درێژەوە کە سووتەمەنی تێـدا دەســـووتێ و شـــەوق ئەداتـــەوە ٢. چلۆســـک؛ چلۆسکە؛ چلوسک؛ مێڵەدە؛ مێلیدە؛ چۆڵـەچرا؛ چۆلەچراو؛ چراوک؛ چاوڵە؛ چراولە؛ ئەختەرمـە؛ بـزووت؛ سـەرەبزۆت؛ سـەلکەبزۆت؛ شاپلـیتە؛ یەلموم؛ خـەتیرە؛ سولـەچرا؛ چومـەت؛ هۆتـەر؛ شرەی گرگری لە دارەوە پێچراو کـە لـە چـرای دەسـتهەلـگر دەچـێ ٣. ئـاورگ؛ ئـامێرێ لـە دەزگای گەرمادەر (وەک شۆفاژ یـان گـەرماو) بـۆ هەلکردنی شۆلە ٤. *[مجازی]* شتێ کە بە وێنەی مەشخەڵ دەبێتە هۆی ڕووناکی ‹مشعل معرفت: مەشخەلی ماریفەت›.

▣ **مشــعل بــونزن:** مەشخەلــی گــازســۆز؛ کەرەسەیەک بـە تەشـکی لوولەیـەکی ڕێکـی کون-کون کە لەوێڕا هەوای بۆ دێت و لەگـەڵ گازدا تێکەڵ دەبێ و وێڕای گرین، شۆڵەیەکی ئاوی زۆر گەرم بەدی دێنێ.

**مشعلدار** / maš'aldār ، ـهـا؛ ـان/: [عربی/ فارسـی] *اسم.* گرهەلگر؛ مەشخەڵدار: ١. مەشخەڵهەلـگر ٢. *[مجـازی]* ئـەوەی بـە بـیر و زانسـتی خـۆی ڕێپیشاندەری خەڵـکە ‹ مشـعلدار آزادی؛ مشـعلدار دانش: گرهەلگری ئازادی؛ مەشخەلداری زانست›.

**مشعوف** / maš'ûf/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* شـادمان؛ شاد؛ دڵخۆش؛ خۆشحاڵ؛ کەیفخۆش ‹از موفقیـت شما بسیار مشعوف شدیم: لـە سـەرکەوتنتان گەلـەک شادمان بووین›

**مشغله** / mašqale ، ـها؛ مشاغل/: [عربی] *اسـم.* کـار؛ سەرقاڵی: ١. کاروبار؛ هەرمانـە؛ فرمـان؛ ئـیش؛ ڕەوتی خەریک بوون بە شتێکەوە ‹زیـادی مشـغله نمی‌گذارد به خودم برسم: کـاروبـاری زۆر ناهێڵـێ بـە خۆمدا ڕابگەم› ٢. پیشە ‹باید مشغله‌ای پیدا کنی کـه هم سرت گرم شود هـم درآمـدی داشته باشی: دەبـێ کارێ بدۆزیەوە کە هەم پێوە خەریک بـێ، هـەمیش داهاتێکت هەبێ›.

**مشــغول**[1] / mašqûl/: [عربـی] *صفت.* سـەرگەرم؛ پەرژاو: ١. خەریک؛ بە ئیش ‹در کارخانـه مشـغول

است: لە کارخانەدا خەریکە› ۲. خەرکاو؛ خجڵ ‹فکرش مشغول است: بیری خەرکاوە› ۳. سەرقاڵ؛ خەجڵ؛ خەریک ‹خود را مشغول کردە است: خۆی سەرقاڵ کردووە›.

**مشغول**[۲]: *قید.* سەرقاڵ؛ سەرگەرم؛ خەریک؛ خەریکوو؛ لەزک؛ لەگژ؛ خووەدی؛ خووەیی؛ لێلێ؛ پاپا؛ مژوڵ؛ لە بار و دۆخی ئەنجامدانی کارێ ‹مشغول کار است: سەرقالی کارە›.

▣ **مشغول ذمه:** ئۆباڵ وەئەستۆ؛ ئۆباڵ وەمل؛ کەسێ کە بەرپرسی تاوانی کەسێ‌تر بێ.

**مشغولیات** / mašqûlîyyāt/: [عربی]/*اسم.* ۱. جمعِ ☜ **مَشغولیّت** ۲. *[مجازی]* چەرەس؛ چەرەز؛ شەوچەرە؛ خواردەمەنی؛ خواردنی خۆ پێ خلافاندن (وەک ئاجیل).

**مشغولیت** / mašqûlîyyat ، ـها؛ مشغولیّات/: [عربی] /*اسم.* پژگاڵ؛ سەرگەرمی؛ دۆخ یا چۆناوچۆنی سەرپەرژان؛ خەریک بوون ‹جز کتاب خواندن و گفتگو با دوستان مشغولیت دیگری نبود: جگە لە کتێب خوێندن و قسە و باس لەگەڵ دۆستان سەرپەرژانێکی‌تر نەبوو›.

**مشفق** / mošfeq ، ـان/: [عربی] *صفت. [ادبی]* دلۆڤان؛ مێهرەبان؛ دلنەرم ‹دوست مشفق: دۆستی دلوڤان›.

**مشق** / mašq ، ـها/: [عربی]/*اسم.* مەشق: ۱. ئەرکی چەندپاتەکردنەوە بۆ شارەزا بوون ‹مشق ویولن کردن: مەشقی ویۆلون کردن› ۲. کار و ڕەوتی خۆ تەیارکردن؛ ئامادە بوون ‹مشق رفتن بە فرنگ را می‌کرد: بۆ ڕۆشتن بۆ فەرەنگ خوی تەیار دەکرد›.

▣ **مشق خط:** مەشقی خەت؛ نووسینەوە؛ کاری لە بەر خەت گرتنەوە؛ لە ڕووی خەتێکی جوان، جار لە دووی جار نووسین بۆ خۆشخەت بوون.

▣ **مشق دادن:** مەشق دان؛ مەشق پێدان: ۱. ڕاهێنان؛ فێرکردن بە ڕاهێنان و چەندپاتە کردنەوە ‹روزی چند ساعت ما را مشق می‌دادند: ڕۆژێ چەن سەعات مەشقیان دەدایین› ۲. دەستوور دان بە مەبەستی ئەنجامدانی ڕاهێنانێکی دیاریکراو ‹چهار صفحه مشق دادەاند: چوار پەڕە مەشقیان داوە›.

**مشق کردن:** مەشق‌کردن؛ خۆ ڕاهێنان ‹مشق تیراندازی می‌کردیم: مەشقی تیر هاویشتنمان دەکرد›.

**مشق نوشتن:** مەشق نووسین: ۱. نووسینەوە لە ڕووی کتێبی دەرسی بۆ فێرە نووسین بوون ۲. مەشقی خەت کردن؛ لە ڕووی خەتێکی خۆش جار لە دووی جار نووسینەوە بۆ جوان نووسین.

**مشقات** / mašaqqāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مَشَقَّت**

**مشقت** / mašaqqat ، ـها؛ مشقّات/: [عربی]/*اسم.* چەرمەسەری؛ سەخلەتی؛ گێرەوکێشە؛ نەنگواز؛ کەزلاتەی؛ جەزرەوە؛ کارنگ؛ دەرد و ڕەنج ‹آن سالها خیلی مشقت کشیدیم: ئەو ساڵانە گەلێ چەرمەسەریمان کێشا›.

**مشقت‌بار** / mašaqqatbār/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بە گێرەوکێشە؛ چەتوون؛ کولەمەرگی؛ کوڵەمەرگێ؛ پڕ لە کوێرەوەری ‹زندگی مشقت‌بار: ژیانی بە گێرەوکێشە›.

**مشقی** / mašqî/: [عربی] *صفت.* مەشقی: ۱. سەر بە مەشق ۲. بۆ ڕاهێنان؛ تایبەتی مەشق ‹گلولەی مشقی: فیشەکی مەشقی›.

**مشک** / mašk, mašg ، ـها/: *اسم. [قدیمی]* ۱. مەشکە؛ مەشک؛ لیشکە؛ هەلیزە؛ هەلیز؛ پێستی خۆشەکراو و دوروراوی زۆرتر گا کە ماست و ئاوی تێدەکەن و دەیژەنن و کەرەی لێ دەگرن ۲. مەسکە؛ خیگە؛ خیە؛ هیز؛ هیزە؛ خیزە؛ پێستەی ڕۆن ۳. کوننە؛ کونە؛ کوندک؛ مەشکۆڵە؛ حەندۆلی؛ شیرمەشک؛ دروولە؛ دووگر؛ دۆدانە؛ دۆوانە؛ دوانە؛ پێسە؛ پێستە حەیوانی گووراو کە دۆ و ئاوی تێدا هەڵدەگرن

٤. *[کنایی]* زگ؛ گەدە.

▣ **مشک زدن:** مەشکە ژەندن؛ هەڵیز ژەی/ ژای؛ شەکاندنەوەی مەشکەی پڕ لە ماست و ئاو بۆ گرتنی کەرە.

**مشک کسی بیشتر آب برداشتن:** *[کنایی]* دەستی کەسێ لە سەرتر بوون؛ دەس کەسێ زیاتر چوون.

**با مشک خالی پرهیز آب گفتن:** *[کنایی]* بە زگی خاڵی قورپێنە دان؛ شاتوشووت کردن.

**در مشک خود را گذاشتن:** *[کنایی]* دەرگای نانەوە؛ دۆڵمەیەکی تێ تەپاندن؛ بێدەنگ بوون.

**مشک** / mošk, mešk, mošg, mešg/: [سنسکریت] *اسم.* میشک؛ مسک: ۱. ڕۆنێکی بۆنخۆش بە ڕەنگی قاوەیی و تامی تاڵەوە کە لە نێو توورەکەیەک لە پاڵ ئەندامی زاوزێی نێرەئاسکی میسکیدایە و لە عەترسازیدا بە کەڵکە ۲. ماکی وا کە لە گیاندارانیتری دەگرن ✱ **مشگ**

**مشکبار** / moškbār, mešg-/: [سنسکریت/ فارسی] *صفت.* بە بۆن و بەرامە؛ زۆر بۆنخۆش.

**مشکبو** / moškbû, mešg-/: [سنسکریت/ فارسی] *صفت.* ۱. بە بۆنی میسکەوە ۲. زۆر بۆنخۆش.

**مشکفام** / moškfām, mešg-/: [سنسکریت/ فارسی] *صفت.* *[ادبی]* ڕەشتۆز؛ بە ڕەنگی ڕەشی بریقەدارەوە.

**مشکل**[1] / moškel, mošgel، ـها؛ ـات/: [عربی] *اسم.* گیر و گرفت؛ دژواری؛ گرفت؛ گرفتاری؛ ئاستەنگی؛ هەچەڵ؛ کۆست؛ کۆسپ؛ زەحمەت؛ بار و دۆخی دژوار و هەچەڵ ‹ممکن است مشکل من را حل کنی؟: دەکرێ گیر و گرفتم چارەسەر بکەی؟›.

▣ **مشکل تراشیدن:** گێچەڵ نانەوە؛ گیر و گرفت دروست‌کردن؛ خستنە هەچەڵ؛ گرێ و گۆڵ تێخستن؛ ڕێخ تێخستن؛ گێچەڵەوە تاونەی ‹هر روز برایش مشکلی می‌تراشیدند تا از مسافرتش جلوگیری کنند: هەموو ڕۆژێ گێچەڵێکیان بۆ دەنایەوە بەشکوو لە سەفەرەکەی بخەن›.

**مشکل کسی را حل کردن:** کەلی کەسێ گرتن؛ گیر و گرفتی کەسێک لابردن؛ گرێ بۆ کەسێ کردنەوە؛ لابردنی هەچەڵ و کەند و کۆسپی سەر ڕێگای کەسێ.

**مشکل**[2]: *صفت.* دژوار؛ سەخت؛ ئاستەنگ؛ ئاسێ؛ چەتوون؛ زەحمەت؛ هەچەڵ؛ ئەستەم؛ کەرژاڵ؛ ئارێشە؛ ئاریشە ‹سوآل مشکل: پرسیاری چەتوون›.
هەروەها: **مشکل بودن؛ مشکل شدن؛ مشکل کردن**

**مشکل‌پسند** / moškelpasand, mošgel-، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* دژپەسەن؛ دوژپەسن؛ تایبەتمەندی کەسێک وا بە دژوار شتێک بەردڵی دەکەوێ.

**مشکل‌پسندی** / moškelpasandî, mešgel-/: [عربی/ فارسی] *اسم.* دژپەسەنی؛ دوژپەسنی؛ بە ئەستەم پەسن کردن ‹همین مشکل‌پسندی باعث می‌شود کە نتوانی تصمیمت را بگیری: هەر ئەم دژپەسەنیە ناهێڵێ بڕیاری خۆت بدەی›.

**مشکل‌گشا** / moškelgošā, mošgel-، ـیان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* موشکوڵ‌گوشا؛ ڕاییکەر؛ ڕاهیکەر؛ هۆگر و لێهاتوو بۆ چارەکردنی گیر و گرفت. هەروەها: **مشکل‌گشایی**

▣ **آجیل مشکل‌گشا** ☜ **آجیل**

**مشکوک** / maškûk/: [عربی] *صفت.* ۱. دووشک؛ دوودڵ؛ ناخاترجەم ‹بە مرد ناشناسی مشکوک شد: لە پیاوێکی نەناس دووشک بوو› ۲. جێ‌شک؛ هاوڕێ لەگەڵ دوودڵی و دڵ‌کرمۆڵیدا ‹این تلفن مشکوک است: ئەم تەلەفوونە جێ‌شکە›.

**مشکی** / maški/: *صفت.* بەرمەشکە؛ بەرمەشک؛ لە مەشکە بەرهەم‌هاتوو ‹کره مشکی: کەرەی بەرمەشکە›.

**مشکی**[1] / meškî, mešgî/: [سنسکریت] *اسم.* ڕەش؛ سیا؛ سیاو؛ ڕەژ؛ قیری: **مشگی**

**مشکی** ۲: صفت. ڕەش؛ سیا؛ سیاو؛ ڕەژ؛ قیری؛ قیرین؛ قەلاخی؛ بە ڕەنگی ڕەش ‹موی مشکی: قژی ڕەش›: **مشگی**

**مشکین** / meškîn, mešgîn/: [سنسکریت/ فارسی] صفت. ۱. مسکین؛ بە میسک؛ بۆنخۆش ۲. ڕەشتۆز؛ بە ڕەنگی میسک.

**مشگ** / mašg/ ☜ **مشک**

**مشگ** / mošg, mešg/: [سنسکریت] ☜ **مُشک**

**مشگی** / mešgî/: [سنسکریت] ☜ **مشکی**

**مشما** / mošammā/: [از عربی] *[گفتاری]* ☜ **مشمع**

**مشمائی** / mošammā'î/: [از عربی] ☜ **مشمّایی**

**مشمایی** / mošammāyî/: [از عربی] صفت. *[گفتاری]* مشەمایی؛ مۆمناوی: **مشمّائی**

**مشمئز** / mošma'ez/: [عربی] صفت. بێزار؛ وەڕەز؛ وەڕز؛ جاڕز؛ بێزراو؛ عێدر؛ بێمەعدە؛ وێڕس؛ کەرخ ‹رفتارش همه را مشمئز می‌کرد: ئاکاری هەمووی وەڕەز دەکرد›.

**مشمئز کننده** / mošma'ezkonande/: [عربی/ فارسی] صفت. وەڕزکەر؛ وەڕەزکەر؛ وەڕسکەر؛ قیزەون؛ بێزەون.

**مشمشه** / mešmeše/: [عربی]/سم. ئۆفە؛ ئووفە؛ سەقاو؛ مەقاو؛ مرخە؛ پسکە؛ پزوو؛ مقاو؛ مشمشە؛ پەتای هاوبەشی مرۆڤ و ئاژەڵ کە بە یاو و برین دەرکردنی پێستی ناوەوەی لووت و خڕ بوونەوەی لووی لەنفاوی ئاشکرا دەبێ.

**مشمع** / mošamma'/: [عربی]/سم. مشەما؛ موشەما؛ مشەمما: ۱. مۆمناو؛ مۆمینە؛ مۆمنایی؛ مێوینە؛ قوماشێ کوڵکن کە ڕوویەکی بە مۆمئاسایەکی بریقەدار سواخدراوە و لە سەری نەخش و نیگار چاپکراوە و بۆ سفرە و سەرمێز و ڕووکێشیتر بەکار دێ ۲. مۆمناو؛ مۆمینە؛ چنراوێ ئەستوور بە سواخی لاستیک، پلاستیک، جەوی یان ترەبانتین، کە وەک ڕاخەرێک بەکار دێ ۳. لەزگە؛ ئاماوزێ؛ پەڕۆیەکی تەنک کە ڕوویەکی بە ماکێکی دەرمانی هەڵدەسوون و بۆ دەرمان و ژانبڕان دەیخەنە سەر ئێش: **مُشَمّا**

**مشمعی** / mošamma'î/: [عربی] صفت. مشەمایی؛ لەزگەیی؛ لە جنسی مشەما.

**مشمول** ۱/ mašmûl/: [عربی] صفت. بەرکەوتوو؛ داگر؛ داگرتوو ‹قاچاقچیان مشمول عفو نمی‌شوند: قاچاخچی بەخشینیان بەرناکەوێ›.

**مشمول** ۲/ ـها؛ ـان؛ ـین//سم. مەشموول؛ گەیشتوو بە تەمەنی سەربازی.

**مشنگ** / mašang/: صفت. *[گفتاری]* لێوە؛ شێت؛ دێوانە.

**مشوب** / mašûb/: [عربی] صفت. ۱. پیس؛ چەپەڵ؛ لەوتی؛ چلکن؛ گەمار؛ تەرێف؛ ڤەزخت؛ زیرگ؛ زیرگن ۲. شێواو؛ ئاشەڤ؛ ئاڵۆز؛ شوسە؛ هەڵشێواو؛ شڵەژاو؛ شەمزاو؛ پەشێو؛ پەشۆکاو؛ چەواشە؛ ژەلمە؛ منتەوەش؛ گژۆلە؛ بێسەر و بەرە؛ پەنزەهار.

**مشورت** / mašverat, mašvarat ، ـها/: [عربی] /سم. ڕاوێژ؛ ڕابێژ؛ ڕابێژەک؛ تەگبیر؛ تەگبیر و ڕا؛ شێور؛ شیرەت؛ مشەور؛ بەینباس؛ کار و ڕەوتی قسە و باس کردن پتر لەگەڵ ژیران و پیران لەمەڕ هەڵسەنگاندنی کارێ یان ڕووداوێ ‹با دوستان مشورت کردم: دەگەڵ دۆستاندا ڕاوێژم کرد›.

**مشوش** / mošavvaš/: [عربی] صفت. پەرێشان؛ پەرێش؛ ئاژ و واژ؛ شاش؛ هاژ؛ شێواو؛ حاڵخراپ؛ پەشێو؛ پەژێو؛ بووژما؛ تووچاو؛ تووچیاگ؛ ڕەتبلاو؛ شاپرزە؛ شپرزە؛ زوێن؛ حاڵ شڕ ‹نباید او را با این خبر مشوش کنی: نابێ بەم هەواڵە پەریشانی بکەی›.

**مشوق** / mošavveq ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. تیژەڤان؛ هەڵخرێن؛ دنەدەر؛ شەوقدەر؛ هانەدەر؛ دلگەرمکەر؛ هاندەر.

**مشهد** / mašhad ، مشاهد/: [عربی] /سم. *[ادبی]* جێی شەهید بوون.

**مشهدی**[1] / mašhadî/: [عربی]/سم. مەشـهەدی؛ مەشەیی: ١. /ـها/ هەر کام لـە خەڵـکی شـاری مەشهەد ناوەندی پارێزگای خوراسـانی ڕەزەوی لە ڕۆژهەڵاتی باکووری ئێران ٢. مەش؛ نازناوێکە (بەتایبـەت بـۆ کرێکـاران، جووتیـاران و وردەپـا) ‹مشهدی حسین: مەشەیی حوسـەین›: **مَش؛ مَشتی؛ مَشهدی** *[گفتاری]* ٣. ئەوەی بۆ زیارەتی بارەگـای ئیمامڕەزا چووبێتە مەشهەد.

**مشهدی**[2]: *صفت.* مەشـهەدی؛ سـەر بـە شـاری مەشهەد ‹خربزەی مشهدی: کاڵەکی مەشهەدی›.

**مشـهود** / mašhûd/: [عربـی] *صـفت.* ١. ئاشـکرا؛ بەرچاو؛ دیار ‹آن‌طور کـه مشـهود است مـی‌خواهنـد لوله‌کشی کنند: ئەو جۆرە دیارە بـەنیازن لوولەکێشـی بکەن› ٢. بینراو؛ دیتراو؛ وەبەرچاوکەوتوو.

**مشهودات** / mašhûdāt/: [عربی]/سم. دیتـراوان؛ بەرچاوکەوتوان؛ بینراوان؛ هـەموو ئـەو شـتانەی دێنە پێش چاو ‹مشهودات خود را از صـحنه‌ی دعـوا شـرح دهیـد: دیتراوەکانـــی خۆتـــان لـــەو شـــەڕە دەرببڕن›.

**مشـــهور** / mašhûr ، مشـــاهیر/: [عربـــی] *صـــفت.* بەناوبانگ؛ بەنێوبانگ؛ بەناو و دەنگ؛ خاوەن‌نـاو؛ مەشـــهوور؛ ســـەروەدەر؛ سەرشـــناس؛ نـــاودێر؛ بەدەنگ و ناو؛ نامدار؛ ناودار؛ ناودەرکەر؛ نۆمـدار؛ دەنگدار؛ دەنگین؛ بەناو؛ بـناڤ؛ ناسراو ‹او شـاعر مشهوری است: شاعێرێکی بەناوبانگە›.

**مشهی** / mošahhî/: [عربـی] *صفت.* مـەگێزهێن؛ ئیشتیا خۆشکەر.

**مشی** / mašy ، ـها/: [عربی]/سم. ڕەوت؛ نۆل؛ نول؛ شێوە؛ ڕەفتار؛ تـووزم؛ ڕەوش ‹خـط مشـی: هێڵـە ڕەوت›.

**مشیت** / mašîyyat ، ـهـا/: [عربـی]/سـم. ویسـت؛ خواست ‹مشیت الهی: ویستـی خودایی›.

**مشیمه** / mašîme/: [عربی] ☜ **درونپرده**

**مشـیمیه** / mašîmîyye/: [عربـی]/سـم. پـەردەی سەر گلێنەی چاو.

**مصاحب** / mosāheb ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/سم. هاودەم؛ هامدەنگ؛ هاونشین؛ ئاودەنگ؛ هـاواڵ؛ هاوزمان؛ هاوقسە ‹او برای تو مصاحب خوبی است و می‌تواند چیزهای زیادی یادت بدهد: بۆ تۆ هـاودەمێکی باشە و دەتوانێ شتی زۆرت فێر بکا›.

**مصـــاحبت** / mosāhebat ، ـهـا/: [عربـی]/سـم. هـاودەمی؛ ئـاودەنگی؛ هامـدەنگی ‹یقـین دارم از مصـاحبت او لـذت و بهـره خـواهی بـرد: دڵـنیام لـە هاودەمی ئەو چێژ و بەهرەی زۆر ئەبەی›.

**مصاحبه** / mosāhebe ، ـها/: [عربی]/سم. وت‌وویژ؛ هەڤپەیڤین؛ دیمانە: ١. بـاس و خـواس لەگـەڵ کەسێک بۆ ناسـینی زیـاتری کەسـایەتی خـۆی یاخود زانینی بیر و ڕای سـەبارەت بـە شـتێکی تایبەت ‹مصاحبه‌ی کیهـان فرهنگـی بـا استاد هـژار: وت‌وویـژی کـەیهان فەرهـەنگی لەگـەڵ مامۆسـتا هـــەژاردا› ٢. دانیشـــتنێک بـــۆ وڵام دانـــەوەی کەسـایەتیەکی زۆرتـر ڕامیـاری بـە پرسـیاری هـــەموو جـــۆرەی هەواڵـــدەران و پـــەیامنێران ‹مصاحبه‌ی رئیس جمهور: وت‌وویژی سەرۆک‌کۆمـار› ٣. دانیشتنی تایبەتی بۆ هەڵسـەنگاندنی ڕادەی زانست و لێهاتوویی کەسێک.

▣ **مصاحبه‌ی تلویزیونی**: دیمانەی تەلەڤـیزیۆنی؛ وت‌وویژی تەلەڤیزیۆنی؛ دانیشتنێک بـۆ بـڵاو بوونەوە لە تەلەڤیزیۆن.

**مصـــاحبه‌ی رادیـــویی**: وت‌وویـــژی ڕادیـــۆیی؛ دیمانەی ڕادیۆیی؛ دانیشتنێک بۆ بڵاو بوونەوە لە ڕادیۆ.

**مصاحبه ی مطبوعاتی**: وت‌وویـژی ڕۆژنامـەیی؛ دیمانـــەی ڕۆژنامـــەیی؛ دانیشـــتنێک بـــۆ بـــڵاو بوونەوە لە بڵاڤۆکان.

**مصـــاحبه‌شـــونده** / mosāhebešavande ، ـهـا؛ ـگان/: [عربی/ فارسی]/سم. وت‌وویژ لەگەڵ‌کراو.

**مصـاحبه کننـده** / mosāhebekonande ، ـهـا؛ ـگان/: [عربی/ فارسی]/سم. وت‌وویژیار؛ وت‌وویژکەر.

**مصاحبه گـر** / mosāhebegar ، ـها؛ ـان/: [عربـی/

فارسی]/سم. وت‌وویژیار؛ وت‌وویژکەر.

**مصاحف** / masāhef/: [عربی] جمعِ ☜ **مُصحَف**

**مصادر** / masāder/: [عربی] جمعِ ☜ **مصدر**

**مصادرات** / mosāderāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مصادره**

**مصادره** / mosādere ، ـها؛ مصادرات/: [عربی]/سم. داگیرکاری؛ کاری دەست بە سەردا گرتن؛ دەس لە سەر دانان؛ داگیرکردن لە لایەن زۆردار یان حوکمەتەوە ‹بە دلیل بدهی‌هایی کە بالا آوردە بود، همەی اموالش را مصادره کردند: بە بۆنەی ئەو هەموو قەرزە باری‌هێنابوو، هەموو ماڵ و سامانیان داگیر کرد›.

▣ **مصادره(ی) بە مطلوب**: [منطق] شێوەیەک هەڵەبێژی وەها کە ئەوی دەبێ بێژەر بیسەلمێنێ، دەیکاتە بەڵگە بۆ قسەکانی.

**مصادره‌ای** / mosādere'î/: [عربی] صفت. [گفتاری] داگیرکراو؛ دەست‌بەسەرداگیراو ‹خانەی مصادره‌ای: ماڵی داگیرکراو›.

**مصادف** / mosādef/: [عربی] صفت. ١. تووشیار ‹در راه با آرام مصادف شدم: لە ڕێگادا تووشیاری ئارام بووم› ٢. هاوکات؛ ڕێکەوت ‹عروسی آزاد مصادف بود با عید نوروز: زەماوەنی ئازاد هاوکات بوو لەگەڵ جێژنی نەورۆزدا›.

**مصادیق** / masādîq/: [عربی] جمعِ ☜ **مِصداق**

**مصارف** / masāref/: [عربی] جمعِ ☜ **مَصرَف**

**مصاف** / masāf ، ـها/: [عربی]/سم. ١. [ادبی] شەڕگە؛ هێل؛ مەیدانی جەنگ ٢. [ورزش] جێگای بەڕێوە چوونی کێبەرکێ.

▣ **مصاف دادن**: شەڕکردن؛ جەنگ کردن؛ وە شەڕ هاتن؛ گژیەی؛ جەنگ‌کەردەی.

**بە مصاف کسی/ چیزی رفتن**: چوون بۆ شەڕی کەسێ/ شتێ؛ چوونە شەڕی کەسێ/ شتێ؛ لوای گژێ یۆیرە ‹دو گروه بە مصاف همدیگر رفتند: دوو دەستە چوونە شەڕی یەک›.

**مصافحه** / mosāfehe/: [عربی]/سم. [ادبی] تۆقە؛ تەوقە؛ دەست‌وموشتاق؛ کار و ڕەوتی مچراندن؛ تۆقەکردن؛ مچرین؛ دەست لە ناو دەست نان.

**مصالح** / masāleh/: [عربی]/سم. ١. جمعِ ☜ **مصلَحَت** ٢. کەرەستە؛ کەرەسە؛ کەرسە؛ پەسا؛ کەرستە؛ کەلەستە؛ ئەسپاباتێ کە شتێکی لێ دروست بێ ‹مصالح کار: کەرەستەی کار›.

▣ **مصالح ساختمانی**: کەرەستەی خانووسازی (وەک بەرد، ئاجۆر، ئاسن، سیمان و...).

**مصالحه** / mosālehe ، ـها/: [عربی]/سم. ١. کار و ڕەوتی ئاشت بوونەوە؛ پێکهاتن؛ سازیان؛ ساچیان ٢. چاوپۆشی؛ کار و ڕەوتی لێ‌بووردن؛ چاوپۆشینی لایەنێک لە ماڵی خۆی بە قازانجی لایەنی تر.

**مصایب** / masāyeb/: [عربی] جمعِ ☜ **مُصیبَت**

**مصب** / masab(b) ، ـها/: [عربی]/سم. ئاوڕێژگە؛ ملەگا؛ ڕێژاو؛ ڕێژاف؛ ڕێژگە؛ ڕێژاوگە؛ ڕشتگە؛ سولاڤک؛ ڕەزاو؛ کیە؛ دواوان؛ ئەو شوێنەی چۆم کە تێکەڵ بە زەریا یان چۆمێکی‌تر دەبێ.

**مصب** / massab/: [از عربی]/سم. [گفتاری] مەزەب؛ مەزەو؛ مەسەب؛ ڕێبازی ئایینی.

**مصحح** / mosahheh ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/سم. ١. هەڵەبژێر؛ لابەری هەڵە لە نووسراوە ٢. ڕاست‌کەرەوە؛ کەسێ کە کتێبێکی کۆن لە ڕووی دەسنووسەکانی دەنووسێتەوە، هەڵەی لێ دەسرێتەوە و ئامادەی چاپی دەکا.

**مصحف** / mosahhaf/: [عربی] صفت. دەست‌تێ‌براو؛ دەسکاری کریاگ.

**مصحف** / moshaf ، ـها؛ مصاحف/: [عربی]/سم. [ادبی] ١. کتێب؛ کتێو؛ کتاو؛ پەڕاو؛ پەرتووک؛ پەرتۆک ٢. [کنایی] قورئان.

**مصداق** / mesdāq ، ـها؛ مصادیق/: [عربی]/سم. ڕاستێنە: ١. لەبار؛ ئەو کەسە یان ئەو شتە کە قسەیەک لە باریدایە ‹این حرف در مورد او مصداق ندارد: ئەم قسە لەباری ئەودا نیە› ٢. گەوا؛ گەڤا؛ شایەت؛ گەواه ‹او مصداق بارز حیلەگری است: ئەو

ڕاستینەی زۆر زەقی سەگیەتیە›.

**مصدر** / masdar ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. /مصادر/ سەرچاوە؛ چاوگ؛ چاڤگە؛ ژێدەر؛ ئەوەی کارێکی لـێ دەبێتـەوە ‹او همیشه مصدر خیر است: ئـەو هەمیشـە سـەرچاوەی خێـرە› ۲. /مصـادر/ کاربەدەست؛ کاربەدەس؛ دەسەلاتدار ‹هر کس مصدر کاری می‌شود، دیگر خدا را بنده نیست: هـەر کەس لە کارێکدا دەبێتە کاربەدەست، تـازە خـوای خۆی بەحەق ناناسێ› ۳. /مصادر//دستور/ چـاوگ؛ چاوگـە؛ وشـەیێ کـە نـاوی کارێکـە و بـەبێ لەبەرچاوگرتنی کەس و کات، جێبـەجێ بـوونی کارێـک نیشـان دەدا (وەک «دیـدن: دیـتن» و «رفتن: ڕۆیشتن»).

▣ **مصدر مرخم**: چاوگی کورتـەوەکراو؛ چاوگـێ کە پیتی «ن»ی دوایی لـێ داکـەوتووە (وەک «گفت و شنید»، بە مانای «گفتن و شنیدن»، لـە کوردیدا «وت» لە «وتوویژ»دا، بە مانای «وتن»).

**مصـدری** / masdarî/: [عربـی]/اسـم. [دسـتور] چـاوگی؛ بـار یـان دۆخـی چـاوگ بـوون ‹نون مصدری: نوونی چاوگی›.

**مصـدع** / mosadde'/: [عربـی] صـفت. دەردیسەردەر؛ زەحمەتخۆش‌کەر.

▣ **مصدع کسی شدن**: سەری کەسـێ ئێشـاندن؛ بوونە دەردیسەر بو کەسێک؛ سـەری کەسـێ هێنانە ئێش؛ سەری کەسێک ئێشاندن؛ سـەر و دڵی کەسێ گرتن؛ کاتی کەسـێک گـرتن و بوونە هۆی ئازار دانی ‹از اینکـه مصدع جنابعالی شدم پوزش می‌خواهم: لەوەی کە سەرتانم ئێشـاند داوای لێبووردن دەکەم›.

**مصدوم**[1] / masdûm ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی]/اسم. گەزەندیتوو؛ گەزنلێ‌کەتوو؛ ئازارپێ‌گەیشتوو لە ڕووداوێکـدا ‹مصـدوم درگذشت: گـەزەندیتووەکـە مرد›.

**مصدوم**[2]: صفت. گەزەندیتوو؛ بەرئازارکەوتوو.

**مصـر** / moser(r)/: [عربـی] صـفت. شـێلگیر؛ پێداگر؛ پێچەقێن؛ سوور؛ سـوڕ؛ سـوێڕ؛ هەتـەر؛ مقیر ‹مصر است شما را ببیند: شیلگیرە بتانبینێ›.

**مصراً** / moserran/: [عربی] قید. بە پـێ داگریـەوە ‹مصراً خواهان بازگشتم به خانه است: بە پـێ‌داگریـەوە خوازیاری گەڕانەوەم بۆ ماڵە›.

**مصراع** / mesrā'/: [عربی] ☜ **مِصرَع**

**مصـرانه** / moserrāne/: [عربـی/ فارسـی] قیـد. بـە پێ‌داگریەوە؛ بە سووری ‹مصرانه می‌خواهم به خانـه برگردی: بە پێ‌داگریـەوە داوا دەکـەم بگەڕێتـەوە بـۆ ماڵ›.

**مصرح** / mosarrah ، ـات/: [عربـی] صفت. [ادبی] ڕوونکراوە؛ دەسنیشـان‌کـراو ‹حقوق و آزادی‌هـای مصـرح در قـانون: مـاف و ئازادیگـەلی ڕوونکـراوە لـە قانووندا›.

**مصرع** / mesra' ، ـها/: [عربی]/اسم. خشـتە؛ بـاڵ؛ میسـرەع؛ نیـوە دێـڕ لـە هـۆنراوەی عەرووزیـدا ‹همیشه این مصرع ورد زبانش بود: هر آنکس که دندان دهد نان دهد: هەمیشە ئەم خشتەی لە سەر زار بـوو: ئەوەی ددانی داوە نانیش ئەدا›: **مصراع**

**مصـرف** / masraf ، ـهـا؛ مصـارف/: [عربـی]/اسم. مەسرەف: ۱. کار و ڕەوتی بە کار هێنان ‹داروها را مصرف کردم اما هیچ اثری نداشتند: دەواکانم بە کـار هینـا، بـەلام هـیچ کاریگـەر نـەبوون› ۲. [اقتصاد] ڕەوتی کەلک وەرگرتن لە کەلوپەلی بازرگـانی بۆ بەجێ هێنانی پێداویسـتی یـاکوو لـە بـواری بەرهەم هێناندا کە دەبێتـە هـۆی تـەواو بـوون، کەم بوونەوە یان کۆنە بوونی شتەکە.

▣ **مصرف داشتن**: بە کار هـاتن؛ بـە کـار چـوون ‹این‌ها دیگر امروز مصرف ندارنـد: ئەمانـە ئەمڕۆکـە چیدی بە کار نایەن›.

**مصرف شـدن**: ۱. بـە کـار بـران؛ دە کـارکران ۲. بە کار هاتن؛ دەکار هاتن؛ دەرد خـواردن. هەروەها: **مصرف کردن**

**مصـرف‌کننـده** / masrafkonande ، ـها؛ ـگـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. بەکارهێنەر؛ بەکاربەر؛ ئـەوەی

کەل‌وپەلی ئابووری بە کار دێنێ.

**مصرف گرایی** / masrafgerāyî/: [عربی/ فارسی] /اسم. هۆگری زۆر بە دەکارکردنی لەڕادەبەدەری کەل‌وپەل.

**مصرفی** / masrafî/: [عربی] صفت. دەکارکردنی؛ بەکاربردنی؛ بەکارهاتنی ‹کالای مصرفی: کەلپەلی دەکارکردنی›.

**مصروع** / masrû'/، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. فێدار؛ فێیار؛ خوودار؛ گەشکەدار؛ تووشیاری نەخۆشی فێ.

**مصروف** / masrûf/: [عربی] صفت. بەکاربراو؛ دەکارکراو؛ بەکارهاتوو؛ دەکارهاتوو؛ بەکاربریاگ.

⊡ **مصروف داشتن**: بە کار بردن؛ بە کار هێنان؛ دەکارکردن.

**مصطبه** / mastabe/، ـها/: [عربی] /اسم. [نامتداول] سەکۆ؛ دکە؛ شۆستە؛ توروم؛ دکان؛ مت؛ هەرە.

**مصطکی** / mastakî/: [معرب از یونانی] /اسم. مەسەکی؛ مەستەکی؛ مەسکی؛ دەوەنێکە لە تیرەی دار قەزوان، بە لق‌وپۆی نارێک، گوڵی سەوزی مەیلەو سوور و بەری گچکەی سوورەوە کە شیرەی لێ دەگرن و وەک بنێشت ئەیجاون، بۆنیشی خۆشە ۲. جەوی و شیرەی ئەو دەوەنە.

**مصطلح** / mostalah/: [عربی] صفت. ۱. وەک دەستەواژە لێ‌هاتوو؛ بە زاراوە بووگ ۲. /ات/ باو؛ سەر زار ‹این واژه در میان پزشکان مصطلح است: ئەم وشە لە نێو دوکتوراندا باوە›.

**مصغر** / mosaqqar/: [عربی] صفت. بچووک‌کراو؛ چکۆلەکراو؛ گچکەکراو ‹پسرک مصغر پسر است: کوریژگە بچووک‌کراوی کورە›.

**مصفا** / mosaffā/: [عربی] صفت. دڵگر؛ خۆش؛ باسەفا ‹باغ مصفا: باخی دڵگر›.

**مصلا** / mosallā/، ـها/: [عربی] /اسم. نوێژگە؛ شوێنێکی بەربڵاو کە خەڵکی شار بە کۆمەڵ نوێژی لێ دەکەن: **مصلّی**

**مصلح** / mosleh/، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. ۱. چاکساز؛ باش‌کەرەوە ۲. ئاشت‌دەرەوە؛ رێکخەر ۳. [مجازی] ئاوەدانکار؛ ئاوەدانکەر؛ ئابادکەرەوە.

**مصلحت** / maslahat/، ـها؛ مصالح/: [عربی] /اسم. بەرژەوەندی؛ بەرژەوەند؛ مەسڵەحەت: ۱. رێ‌وشوێنی دروست و باش ‹مصلحت دیدن: مەسڵەحەت دیتن› ۲. تەگبیر؛ خێر؛ بیر و کاری کە قازانجدەرە.

⊡ **مصلحت بودن**: باش بوون؛ بەرژەوەندی بوون؛ خاس بوون؛ گونجاو و بە کەڵک بوون؛ سەلاح بوون ‹مصلحت این بود که محل کارش را عوض کنید: وا باش بوو کە شوێنی کارەکەی بگۆڕن›.

**مصلحت دیدن**: بە باش زانین؛ خێر دیتن؛ گونجاو و بە قازانج هەڵسەنگاندن ‹این طور مصلحت دیدند فعلاً همانجا باشد: وایان بە باش زانی جارێ لەوێ بێ›. هەروەها: **مصلحت دانستن**

**بە مصلحت کسی بودن**: بە بەرژەوەندی کەسێک بوون؛ بە بەرژەوەندی زانین بۆ کەسێ؛ بە قازانجی کەسێ بوون؛ بە خێری کەسێ بوون.

**مصلحت‌اندیش** / maslahat'andîš/، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. خێربین؛ قازانجبین؛ بەرژەوەندبین. هەروەها: **مصلحت‌اندیشی**

**مصلحتی** / maslahatî/: [عربی] صفت. مەسڵەحەتی؛ بە پێی بەرژەوەندی.

**مصلوب** / maslûb/: [عربی] صفت. چوارمێخە؛ چوارنیخە؛ لە خاچدراو؛ بە سەلیب‌کێشراو؛ بە مێخداکراو؛ هەر چوار پەل بەسراو ‹گفته می‌شود حضرت عیسی(ع) مصلوب شد: وا دەڵێن حەزرەتی عیسا(س) چوارمێخە کێشرا›.

**مصلی** / mosallā/: [عربی] ☜ **مصلّا**

**مصمت** / mosammat/، ـها/: [عربی] صفت. [زبان‌شناسی] کپ؛ کپەنە؛ قپ؛ بێ‌دەنگ.

**مصمم** / mosammam/: [عربی] *صفت*. کوڕڕە؛ لەزگ؛ لێبڕاو؛ پێگرتی؛ سوور لە سەر مەبەست و دلگەرم لە دۆزدا ‹مصمم است که بماند: لێبڕاوە بمێنێتەوە›.

**مصنف** / mosannef، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/*اسم*. دانەر ‹مصنف می‌گوید ۱۰ سال بر روی کتابش کار کرده است: دانەر دەڵێ ۱۰ ساڵ لە سەر پەرتووکەکەی کاری کردووە›.

**مصنفات** / mosannafāt/: [عربی]/*اسم*. نووسراوەگەل؛ سەرجەمی ئەو نووسراوانە لە لایەن کەس یان تاقمێکەوە لە سەردەم یان وڵاتێکی دیاریکراودا دانراون ‹مصنفات ملا عبدالکریم مدرس: نووسراوەگەلی مەلا کەریم›.

**مصنوع** / masnû'/: [عربی] *صفت*. دەسکرد: ۱. /ـات/ چێکراو؛ وەبەرهێنراو ۲. دەسکردی ۳. *[ادبی]* تایبەتمەندی پەخشانێک کە زۆر جوانکاری توێکلی لە سەر کراوە.

**مصنوعات**/ masnû'āt/: [عربی]/*اسم*. بەرهەمگەل؛ بەرهەمان؛ کۆی ئەو شتانە چێکراون، بەتایبەت بەرهەمگەلی پیشەسازی ‹مصنوعات داخلی: بەرهەمگەلی ناوخۆیی›.

**مصنوعی** / masnû'î/: [عربی] *صفت*. دەسکرد: ۱. دەسکار؛ دەستکرد؛ کاری دەست بەتایبەت لە ڕێی پیشەسازیەوە ‹ابریشم مصنوعی: هەورێشمی دەسکرد› ۲. *[کنایی]* ڕواڵەتی؛ نارەسەن؛ نەک بە ڕاستی ‹رفتار مصنوعی: ئاکاری ڕواڵەتی›.

**مصوب** / mosavvab/: [عربی] *صفت*. پەسەنکراو؛ وەرگیراو ‹قانون مصوب سال گذشته: قانوونی پەسەنکراوی ساڵی پێشوو›.

**مصوبات** / mosavvabāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مصوّبە**

**مصوبه** / mosavvabe، ـها؛ مصوبات/: [عربی]/*اسم*. ۱. پەسندکراوە؛ پەسەنکراو؛ وەرگیراوە؛ ئەوەی لە دامەزراوەیەکی فەرمیدا ڕای لە سەر درابێ ‹مصوبەی مجلس: پەسندکراوەی پارلەمان› ۲. پەسەندنامە.

**مصوت** / mosavvat, mosavvet، ـها/: [عربی] *صفت. [زبان‌شناسی]* دەنگدار.

**مصور** / mosavvar/: [عربی] *صفت*. وێنەدار؛ نیگارکراو؛ نیگاردار ‹کتاب مصور: پەرتووکی وێنەدار›.

**مصون** / masûn/: [عربی] *صفت*. پارێزراو؛ بێ‌وەی؛ دوور لە زیان و ئازار ‹جان و مال هر کس باید از تعرض مصون باشد: گیان و ماڵی هەموو کەسێ ئەبێ بپارێزرێ›.

**مصونیت** / masûnîy(y)at، ـها/: [عربی]/*اسم*. پارێزراوی: ۱. بار و دۆخی بێ‌وەی بوون ‹نمایندگان از مصونیت سیاسی برخوردارند: نوێنەران لە پارێزراوی سیاسی بەشدارن› ۲. هێزی بەرگری لە ئاست نەخۆشیەکی دیاریکراو بۆ تووشیار نەبوونی ‹واکسن تولید مصونیت می‌کند: واکسین پارێزراوی بەرهەم دێنێ›.

**مصیبت** / mosîbat، ـها؛ مصایب/: [عربی]/*اسم*. ۱. کارەسات؛ چام؛ پەتەر؛ چۆرتم؛ کەڵەمە؛ ئاشێو؛ نەگبەت؛ دومات؛ لێقەوماوی؛ گرگاشە؛ نەیامەت؛ نەهامەت؛ ئاپۆر؛ ئاپۆرە؛ قەدا؛ ڕووشە؛ مسیبەت؛ ناراو؛ تەنگ و چەڵەمە؛ چەل و مل؛ تەگەرە و تووشی؛ بەسەرهات و ڕووداوی ناخۆش ‹بیچاره دچار بد مُصیبتی شد: بەستەزمان تووشیاری کارەساتێکی خراپ هات› ۲. خەم؛ کەسەر؛ خەفەت؛ جەخار؛ مەینەت؛ کوڵ؛ پەژارە؛ تەمیان؛ مۆژە ‹ما را در مصیبت خود شریک بدانید: ئێمەش هاوبەشی خەمی خۆتان بزانن›.

**مصیبت بار** / mosîbatbār/: [عربی/ فارسی] *صفت*. خەمهێنەر؛ پەژارەدەر؛ خەمخێز؛ مەینەتاوی؛ تەمیانی.

**مصیبت دیده** / mosîbatdîde، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *صفت*. لێقەوماو؛ تووشیاری چەڵەمە و چۆرتم هاتوو.

**مصیبت‌کشیده** / mosîbatkešîde ، ـها؛ ـگان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* لێقەوماو؛ لە ژێر باری تەنگ و چەڵەمە و نەگبەتیدا ژیاو.

**مضار** / mazār(r)/: [عربی] جمعِ ☜ **مَضَرَّت**

**مضاربه** / mozārebe/: [عربی]/*اسم.* *[اقتصاد]* موزارەبە؛ جۆرێک سەودا، کە لایەنێک بە ماڵ و ئەوی‌دیش بە کار دەبنە هاوبەش و داهاتەکەی بەش دەکەن.

**مضاربه‌ای** / mozārebe'î/: [عربی] *صفت.* موزارەبەیی؛ بە شێوەی موزارەبە.

**مضارع** / mozār'/: [عربی]/*اسم.* *[دستور]* ئێستا؛ ڕانەبورد؛ ڕانەبردوو؛ ڕانەبوار؛ کاتی کرداری ئێستا و داهاتوو (وەک: می‌آیم: دێم، می‌خوریم: دەخۆین، می‌نشینی: دادەنیشێ و...).

▣ **مضارع اخباری:** *[دستور]* ڕانەبردووی هەواڵی؛ دۆخی هەواڵی کردار لە کاتی ئێستادا (وەک: می‌روم: دەچم).

**مضارع التزامی:** *[دستور]* ڕانەبردووی مەرجی سادە؛ کرداری ڕانەبردوو، وێڕای دردۆنگی و ئەگەر یان جەختکردن (وەک: باید بروم: دەبێ بڕۆم، شاید برود: ڕەنگە بڕوا).

**مضاعف** / mozā'af/: [عربی] *صفت.* دووهێندە؛ دووئەونە؛ دووئەوەندە؛ دووبەرانبەر؛ دوەبەرامبەر؛ دووچەنانە؛ دووقات؛ دووچەندانە؛ دووئەونە؛ دووجار هێندە ‹در طی دو سال گذشته هزینه‌ها مضاعف شده، ولی درآمد تغییری نکرده است: لە ماوەی دوو ساڵی ڕابردوودا مەزاخ دووهێندە بۆتەوە، بەڵام داهات هەروەک خۆی ماوە›.

**مضاف** / mozāf/: [عربی]/*اسم.* *[دستور]* ناوێ کە خراوەتە پاڵ ناوێکی‌ترەوە (وەک «کتێبی ئارام» «کتێب» خراوەتە پاڵ «ئارام»ەوە).

▣ **مضاف بر:** لە سەرینەی؛ زیادلە؛ جیا لە ‹مضاف بر این‌ها، ثبت‌نام هم نکرده‌اید!: لە سەرینەی ئەمانە، ناویشتان نەنووسیوە›.

**مضافاً** / mozāfan/: [عربی] *قید.* سەرەڕای ئەمە؛ سەرڕا؛ زیادە لەوە؛ زیاد لەوە ‹مضافاً گفته می‌شود که او فعلاً در دیاربکر است: سەرەڕای ئەمە دەڵێن ئێستاکە لە دیاربەکرە›.

**مضاف‌الیه** / mozāfon'elayh/: [عربی]/*اسم.* *[دستور]* ناوێ کە ناوێکی‌تر دەخرێتە پاڵی (وەک «برای من»، «برای» خراوەتە پاڵ «من»ەوە).

**مضامین** / mazāmîn/: [عربی] جمعِ ☜ **مضمون**

**مضایقه** / mozāyeqe/: [عربی]/*اسم.* کۆتایی؛ دەس‌ڕاگری؛ کوتری؛ کۆتاهی؛ درێغ؛ درێخی؛ کار و ڕەوتی دەست ڕاگرتن بەتایبەت لە دانی شتێ.

▣ **مضایقه کردن:** کۆتایی‌کردن؛ دەس ڕاگرتن؛ درێغ‌کردن ‹از کمک به ما مضایقه کرد: لە یارمەتی دانمان کۆتایی کرد›.

**مضایقه نداشتن:** دەس ڕانەگرتن؛ کۆتایی نەکردن؛ درێغ نەکردن ‹من از پرداخت پول مضایقه ندارم، ولی نمی‌توانم با شما بیایم: من لە دانی پارەدا دەس ڕاناگرم، بەڵام ناتوانم لەگەڵتان بێم›.

**مضبوط** / mazbût/: [عربی] *صفت.* ۱. تۆمارکراو ‹بخشی از تاریخ کرد و کردستان در شرفنامه‌ی بدلیسی مضبوط است: بەشێک لە مێژووی کورد و کوردستان لە شەرەفنامەی بدلیسیدا تۆمارکراوە› ۲. مرێس؛ تەکووز؛ ڕێک‌وپێک؛ تەکوویس؛ تەکوویز؛ ڕاست و دروست.

**مضحک** / mozhek/: [عربی] *صفت.* پێکەنینی؛ گاڵتەجاڕ؛ پێکەنیناوی؛ کەنیندار؛ قەشمەر ‹تصویر مضحک؛ رفتار مضحک: وێنەی پێکەنینی؛ کردەوەی قەشمەر›.

**مضحک‌قلمی** / mozhekqalamî/: [عربی/ معرب] *اسم.* *[نامتداول]* ۱. کارتۆن؛ فیلمی کارتۆنی ۲. *[قدیمی]* کاریکاتۆر.

**مضحکه** / mazhake/: [عربی]/*اسم.* گاڵتەجاڕ؛ گاڵتەباز: ۱. ئەوەی پێکەنین بێنێ، بەتایبەت شانۆی کۆمێدی ۲. گەپجاڕ؛ کەس یان شتێ کە

ببێتـه ڕیشـخەنی خەڵـک ‹تـو بـا ایـن رفتـارت مضحکەی مردم شدەای: تۆ بـەم ئاکـارەت بوویتەسـە گاڵتەجاڕی خەڵک›.

**مضـــر** / mozer(r)/: [عربـی] صـفت. زیـانۆک؛ زەرەردەر؛ زیاندار؛ گەزەندار؛ وەزەندار؛ بە زیـان؛ بە ئازار؛ بە وەی.

**مضراب** / mezrāb ، ـها/: [عربـی] اسـم. دەنووکـە؛ پێژەن؛ لەتەیەکی بچووک و باریک لـە ئێسـک، پلاستیک، چێو یان کانزا کە سازی ژێداری پـێ دەژەنن.

**مضرات** / mazarrāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مَضَرَّت**

**مضـرب** / mazrab ، ـهـا/: [عربـی] اسـم. لێـدراوە؛ بەرهەمی لێکدرانی ژمارەیەک لە ژمارەیەکی تـر ‹۳۵ مضرب ۵ و ۷ است: ۳۵ لێدراوەی ۵ و ۷ ە›.

▣ **مضرب مشترک**: لێـدراوەی هاوبـەش؛ ژمـارە یـان هەنـدێ کـە بـە سـەر دوو یـان چـەن ژمارەی‌تردا دابەش دەبێ ‹۳۵ مضرب مشترک ۵ و ۷ و ۳۵ اسـت: ۳۵ لێـدراوەی هاوتـای ۵ و ۷ و ۳۵ ە›.

**مضرت** / mazarrat ، ـهـا؛ مضـرات؛ مضـار/: [عربـی] اسـم. ۱. ئـازار؛ ئاسـیب؛ ئاسـیو؛ گـەزەن؛ درم ۲. زیـان؛ زەرەر؛ وەزەن؛ وەزەنـگ؛ تـەوەرە؛ تەمەرە؛ پێوەر.

**مضرس** / mozarras/: [عربی] صفت. گرنج‌ـگـرنج؛ ددانەدار.

**مضروب** / mazrûb/: [عربی] اسم. لێدراو: ۱. ـها؛ ـان؛ ـین/ ئەوی لێیان داوە ‹ مضروب شـکایت کـردە اسـت: لێـدراو شـکاتی کـردووە› ۲. *[ریاضـی]* ژمارەیەک کە بە ژمارەیەکی‌تر لێدراوەتـەوە ‹در ۲۴=۸×۳، عدد ۳ مضروب است: لە ۲٤=۸×۳دا ژمارەی ۳ لێدراوە›: **بس‌شُمُردە**

**مضـــروب‌فیـــه** / mazrûbonfîh/: [عربـی] اسـم. *[ریاضی]* لێدراوە؛ ژمارەیـێ کـە ژمارەیـەکی‌تـری لێ‌دەدەن ‹در ۲۴=۸×۳، عدد ۸ مضروب‌فیه است: لـە ۲٤=۸×۳دا ژمارەی ۸ لێدراوەیە›: **بس‌شُمُر**

**مضـطر** / moztar/: [عربـی] صـفت. *[ادبـی]* دامـاو؛ داماگ؛ قوڕەماو؛ لێ‌قەوماو.

**مضـطرب** / moztareb ، ـهـا؛ ـان؛ ـیـن/: [عربـی] صـفت. پـەرۆش؛ پەشـێو؛ هـەژیو؛ واژ؛ دڵـخور؛ دڵخورت؛ شـێواو؛ تووشـی دڵـەڕاوکێ؛ تووشـی دڵەخوڕپێ ‹از شنیدن این خبر خیلی مضطرب شد: لـە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر پەرۆش بوو›.

**مضمحل** / mozmahel(l)/: [عربی] صفت. بنەبڕ؛ تەفر و توونا؛ فـەوتاو؛ نـەماو؛ لـە بـەین چـووگ ‹ارتـش شاهنشـاهی در مـدت کوتـاهی مضـمحل شـد: ئەرتەشی شاهەنشاهی لە ماوەیـەکی کەمـدا تـەفر و توونا کەوت›.

**مضموم** / mazmûm/: [عربی] صفت. بـۆرەدار؛ بـە نیشانی فونێتیکی بۆرەوە. (وەک لە وشەی «شُما» دا، پیتی «ش» بۆرەدارە. ئەم نیشـانە لـە ڕێنووسـی کوردیدا بۆتە «و»).

**مضمون** / mazmûn ، ـها؛ مضـامین/: [عربـی] اسـم. ناوەرۆک؛ ناوەرۆکە؛ ناوەڕۆک؛ چەمک؛ نـاواخن: ۱. مەبەستێ کە لە تۆی وتار یان نووسراوەیەکدا دەرئەبـڕدرێت ‹مضـمون نامـەاش شـکایت از وضـع خودش بود: ناوەرۆکی نامەکەی گلەیی لە بار و دۆخی خۆی بوو› ۲. ئەوەی هونەرمەند لە بەرهەمەکەیدا دەری ئەبڕێ ‹فیلمی با مضمون تربیتی سـاختە اسـت: فیلمێکی بە چەمکی پەروەردەیی دروست کـردووە› ۳. *[ادبی]* مانایەکی ورد و جـوان کـە شـاعیر لـە هۆنراوەیەکدا ئەیخولقێنێ.

▣ **مضمون کوک کردن**: حەنـەک هەڵبەسـتن؛ لێب ساز دان؛ قسەی گاڵتە و گـەپ دروسـت کردن ‹رفقا بـرایش مضـمون کـوک کـردە بودنـد: دۆستان حەنەکیان بۆ هەڵبەستبوو›.

**مضـیقه** / mazîqe ، ـهـا/: [عربـی] اسـم. تەنگانـە؛ تەنگژە؛ تەنگەبەری؛ تەنگاوی؛ تەنگ و چەڵـەمە؛ تەنگی: ۱. هەل‌ومەرجی دژوار و ئاسـتەم ‹بـرای آب در مضـیقه بودنـد: بـۆ ئـاو لـە تەنگانـەدا بـوون› ۲. تەنگدەستی؛ نەداری؛ بێ‌دەرەتانی؛ بێ‌پارەیی

‹در مضیقه افتادن: کەوتنە تەنگانەوە›.
▣ **در مضیقه افتادن**: کەوتنە تەنگانەوە؛ وەتەنگاوی کەوتن؛ کەوتنە تەنگەبەری؛ تەنگەتاو بوون. هەروەها: **در مضیقه بودن**

**مطابق** / motābeq/: [عربی] *صفت*. هاودەق؛ هەمبەر؛ بەرامبەر؛ ئاوتا؛ وێکهاتوو؛ سازگار؛ هاوتا؛ بەرامپێل.

**مطابقت** / motābeqat ، ـها/: [عربی]/*اسم*. هاودەقی؛ هەمبەری؛ دەقاودەقی؛ سازگاری؛ دوخ و چۆنیەتی سازگار بوون و وێکهاتنەوە لەگەڵ شتێکدا ‹بررسی کردم با اصل مطابقت داشت: تاوتوێم کرد دەگەڵ ئەسڵەکەیدا هاودەقی هەبوو›.
▣ **مطابقت دادن**: بەرامبەرکردنەوە؛ هەمبەر نان؛ لە بەر یەک نان/ ڕانان.
**مطابقت داشتن**: وێک هاتنەوە؛ هەمبەر بوون؛ دەقاودەق بوون.
**مطابقت کردن**: ۱. بەرامبەرکردنەوە؛ لە بەر یەک ڕانان ‹این صد صفحه نمونەی اول را با خبر مطابقت کن!: ئەم سەد لاپەڕە نموونەی یەکەمە لەگەڵ خەبەرەکەدا بەرامبەر کەوە!› ۲. دەقاودەق بوون؛ وێک هاتنەوە ‹نسخەی شما با اصل مطابقت می‌کند: ئەم ڕوونووسەی ئێوە لەگەڵ ئەسڵەکەیدا دەقاودەقە›.

**مطاع** / motā'/: [عربی] *صفت*. لەسەر چاوان؛ لەسەر سەر؛ شیاوی فەرمانبەری و ملڕاکێشی ‹امر جنابعالی مطاع است: دەستووری جەنابتان لە سەر چاوانە›.

**مطالب** / matāleb/: [عربی] جمعِ ☜ **مطلب**

**مطالبات** / motālebāt/: [عربی]/*اسم*. داخوازی؛ داخواز؛ داخواست: ۱. سەرجەمی ئەوەی دەبێ وەربگیردرێ ‹مطالبات شرکت از مشتریان هنوز وصول نشده است: داخوازی بەشدارگە لە مشتەریەکانی هێشتا وەرنەگیراوە› ۲. داواکاری؛ سەرجەمی ئەو شتانەی داواکراون ‹مطالبات مردم باید برآورده شود: داواکاری خەڵک دەبێ جێبەجێ بێ›.

**مطالبه** / motālebe/: [عربی]/*اسم*. داوا: ۱. کار و ڕەوتی خواستن؛ ویستن ‹آمده بودند و کمک مطالبه می‌کردند: هاتبوون و داوای یارمەتیان دەکرد.

**مطالعات** / motāle'āt/: [عربی] جمعِ ☜ **مطالعه**

**مطالعه** / motāle'e/: [عربی]/*اسم*. ۱. کار و ڕەوتی وەخوێندن؛ ئەوەوەنەی؛ وەندش؛ خوێندنەوە زۆرتر هەر بە چاو و بێ‌دەنگ ‹مطالعەی کتاب: خوێندنەوەی کتێب› ۲. /ـها؛ مطالعات/ کار و ڕەوتی کۆڵینەوە؛ توێژینەوە؛ لێڕوانین ‹روی بیماری جذام مطالعه می‌کند: لە سەر نەخۆشی خورە دەکۆڵێتەوە›.

**مطامع** / matāme'/: [عربی]/*اسم*. جێ تەما؛ جێگەی چاو تێبڕین ‹مطامع آمریکا: جێ تەمای ئەمریکا›.

**مطایبات** / motāyebāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مطایبه**

**مطایبه** / motāyebe ، ـها؛ مطایبات/: [عربی]/*اسم*. *[ادبی]* شۆخی؛ گاڵتە؛ گەمە.

**مطب** / matab(b) ، ـها/: [عربی]/*اسم*. مەتەب؛ مەحکەمە؛ شوێنێ کە بژیشک نەخۆشی لێ دەبینێ.

**مطبخ** / matbax ، ـها/: [عربی]/*اسم*. *[قدیمی]* چێشتخانە؛ ئاشگە؛ ئاشپەزخانە؛ شوێنێ کە چێشت و نانی لێ چێ دەکەن.

**مطبعه** / matba'e ، ـها/: [عربی]/*اسم*. *[قدیمی]* چاپخانە.

**مطبق** / motabbaq/: [عربی] *صفت*. *[نامتداول]* تۆ-تۆ؛ چین-چین؛ چین لە سەر چین؛ بنەڵبن؛ تۆ سەر تۆ.

**مطبوع** / matbû'/: [عربی] *صفت*. ۱. خۆش؛ خوەش؛ وەش؛ دڵخواز؛ دڵواز ‹هوای مطبوع؛ غذای مطبوع: هەوای خۆش؛ چێشتی خۆش› ۲. *[قدیمی]* چاپی؛ چاپکراو؛ لە چاپدراو.

**مطبوعات** / matbû'āt/: [عربی]/*اسم*. چاپەمەنی: ۱. بەلاڤۆک؛ بلاڤۆک؛ پەخشە؛ سەرجەمی ئەو

چاپەمەنیانەی لە ماوەگەلی دیاریکراودا لە چاپ دەدرێن و بلاو دەبنەوە (وەک ڕۆژنامە و گۆڤار) ۲. سەرجەمی ئەو شتانەی لە چاپ دەردەچن ‹مطبوعات پیش از انقلاب: چاپەمەنی پێش لە شۆڕش›.

**مطبوعاتی** [1] / matbû'ātî ، ـها/: [عربی]/اسم. ڕۆژنامەفرۆشی؛ فرۆشگای چاپەمەنی.

**مطبوعاتی** [2]: *صفت*. ۱. چاپەمەنی؛ سەر بە چاپەمەنی ‹فعالیت مطبوعاتی: چالاکی چاپەمەنی› ۲. ڕۆژنامەوان ‹شوهرش مطبوعاتی است: مێردەکەی ڕۆژنامەوانە›.

**مطران** / metrān ، ـها/: [معرب از یونانی]/اسم. مەتران؛ مێتران؛ سەرۆکی کلیسای پارێزگا یان ولاتێک لە کلیسای ڕۆژهەلاتدا.

**مطرب** / motreb ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. *[گفتاری]* لۆتی؛ سازنە؛ گۆرانیبێژ؛ سازژەن بۆ سەما، بەتایبەت ئەوانەی هەڵپەڕکێ، گۆرانی و ئاهەنگی خێڵەکی بەڕێوە دەبەن.

**مطربی** / motrebî/: [عربی]/اسم. لۆتیگەری؛ گۆرانیبێژی؛ کاری لۆتی.

**مطرح** / matrah/: [عربی] *صفت*. جێباس؛ لە بەر سەرنج و گفتوگۆ ‹ این موضوع مطرح نیست: ئەم بابەتە جێباس نیە›. هەروەها: **مطرح بودن؛ مطرح شدن؛ مطرح کردن**

**مطرود** [1] / matrûd ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. وەلانراو؛ لاوەنراو؛ دەرکراو؛ دوورخراو؛ نەویستراو ‹سیاستمدار مطرود: ڕامیاری وەلانراو›.

**مطرود** [2]: *قید*. بە دەرکراوی؛ بە لانراوی ‹مطرود ترک دیار کرد: بە دەرکراوی ولاتی بەجێهێشت›.

**مطلا** / motallā/: [عربی] *صفت*. زێڕکفت؛ زێڕساو.

**مطلب** / matlab ، ـها؛ مطالب/: [عربی]/اسم. ۱. داخواز؛ خواست؛ داوا ‹آزاد آمد و مطلب خود را به پدرش گفت: ئازاد هات و داخوازی خۆی بە بابی گوت› ۲. مەبەست؛ چەمک؛ درغە؛ هەواڵ؛ خەبەر یان مەبەستێ کە لە تۆی وتار یان نووسراوەیەکدا دێ ‹مقالەاش فقط پرحرفی بود و هیچ مطلبی نداشت: وتارەکەی هەر فرەوێژی بوو، دەنا هیچ مەبەستێکی تێدا نەبوو› ۳. نووسراوەیێ (وەک هەواڵ، گوزارش یان چیرۆک) کە بۆ چاپ لە بەلاڤۆک یان بلاوکردنەوە لە ڕادیۆ ڕەچاو دەکرێ.

**مطلع** / matla'/: [عربی]/اسم. ۱. جێ هەلات؛ جێ دەرکەوتنی تەنێکی ئاسمانی (وەک مانگ و خۆر) ۲. /ـها/ سەرهۆنە؛ یەکەمین بەیتی شێعر (غەزەل، قەسیدە) ۳. سەرەتا؛ دەسپێک ‹مطلع سخن: سەرەتای قسە›.

**مطلع** / mottale' ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. ئاگا؛ هاگا؛ ئاگادار؛ ئاگار؛ هایا؛ خەبەردار؛ هایلێ؛ هایدار؛ بە ئاگا؛ ئایە. هەروەها: **مطلع بودن؛ مطلع شدن؛ مطلع کردن**

**مطلق** / motlaq/: [عربی] *صفت*. ۱. تەواو؛ بێسنوور؛ بێکەمایەتی ‹آزادی مطلق؛ زیبایی مطلق: ئازادی بێسنوور؛ جوانی تەواو›: **مطلقه** ۲. *[دستور]* دەرباز؛ دەرباس؛ ڕەها؛ بێ هیچ پێوەندیەک لەگەڵ ماکی ڕێزمانیتردا ‹اسم مطلق اسمی است که با هیچ اسم یا صفتی همراه نیست: ناوی دەرباز ناوێکە وا لەگەڵ هیچ ناو یان ئاوەلناوێکدا هاوڕێ نیە› ۳. بێوێنە و بێشەریک.

**مطلقاً** / motlaqan/: [عربی] *قید*. ۱. بە تەواوی؛ تەواو؛ یەکسەرە ‹مطلقاً دروغ می‌گوید: بە تەواوی درۆ ئەکا› ۲. قەت؛ هەر؛ هەرگیز؛ هەرگیزای‌هەرگیز؛ بە هیچ‌جۆر؛ ببڕای‌ببڕای؛ ببڕای‌بڕ ‹مطلقاً او را ندیدەام: قەت نەمدیوە›.

**مطلقه** / motallaqe ، ـها/: [عربی] *صفت*. تەلاقدراو؛ تلاق‌دریەی؛ جیاوەبوو ‹همسر مطلقەی او شکایت کردە است: ژنە تەلاقدراوەکەی شکاتی کردووە›.

**مطلقه** / motlaqe/: [عربی] ☜ **مطلق ـ۱**

**مطلوب** / matlûb/: [عربی] *صفت*. ۱. خوازراو؛ داواکراو؛ ویستراو ‹کمال مطلوب: کەماڵی خوازراو›

٢. باش؛ شیاو؛ لەبار؛ پەسەن ‹وضعیت مطلوب: بار و دۆخی باش›.

**مطلوبیت** / matlûbîyyat/: [عربی]/اسم. لەباری؛ شیاوی؛ پەسەنیەتی؛ دۆخ یان چۆنیەتی باش بوون.

**مطمئن** / motma'en(n)/: [عربی] صفت. خاترجەم؛ دڵنیا: ١. بێخەم؛ ئەرخەیان؛ ئارخەیان؛ فریقەت ‹از خودش مطمئن است: لە خۆی دڵنیایە› ٢. شیاوی دڵنیایی ‹از او مطمئن باش: لێ خاترجەم بە›.

**مطمئناً** / motma'ennan/: [عربی] قید. خاترجەم؛ بێشەک؛ حەتمەن ‹مطمئناً الآن می‌آید: خاترجەم ئێستا دێ›.

**مطنجن** / motancan/: [از عربی؟]/اسم. [قدیمی] حەوترینگە؛ حەوترینگینە؛ حەفتترنگە؛ حەفتترنگێن؛ حەفتترنگینە؛ مزراویلکە؛ مزراویکە؛ مزەورە؛ مرارۆکە؛ متەنجەنە؛ جلبڕ؛ جلبرووکە؛ شۆربای سماق و هێلکە.

**مطنطن** / motantan/: [عربی] صفت. ١. [نامتداول] بەناوبانگ؛ ناوبەدەر ٢. بەقاوقوو؛ بە دەنگدانەوە ‹سخنرانی مطنطن: وتاربێژی بەقاوقوو›.

**مطهر** / motahhar/: [عربی] صفت. [ادبی] پاک؛ خاوێن؛ پاک و پوار؛ پاکتاو؛ پاکژ؛ پاکیزە.

**مطیع** / motî'/، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. گوێڕایەڵ؛ فەرمانبەر؛ ڕام؛ ژێرفەرمان؛ بەردەست؛ سەرخوار؛ ڕاژێر؛ گوێلەمست؛ ملداو؛ گوێدێر ‹مرد مطیع؛ کارگر مطیع: پیاوی فەرمانبەر؛ کرێکاری گوێڕایەڵ›.

**مظالم** / mazālem/: [عربی] جمعِ ☜ **مظلمه**

**مظان** / mazān(n)/: [عربی] اسم. [ادبی] جێ‌شک؛ جێ‌گومان؛ جێی شک و دڕدۆنگی ‹در مظان تهمت بودن: لە جێ‌شکی بوختاندا بوون›.

**مظاهر** / mazāher/: [عربی] جمعِ ☜ **مَظهَر**

**مظروف** / mazrûf/: [عربی]/اسم. ناوەرۆکی دەفر؛ ئەوەی لە ناو دەفردایە.

**مظفر** / mozaffar/: [عربی] صفت. [ادبی] سەرکەوتوو؛ سەرکەفتی؛ زاڵ.

**مظلم** / mozlem/: [عربی] صفت. [ادبی] نووتەک؛ تنۆک؛ ئەنگوستەچاو؛ تاریک و تنۆک؛ زۆر تاریک.

**مظلمه** / mazlame، مظالم/: [عربی]/اسم. ١. ستەم؛ گووج؛ زۆر؛ زوڵم؛ زۆرداری ٢. [قدیمی] دادخوازی؛ دادبەری؛ دادخوایی.

**مظلوم**[1] / mazlûm، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. بەش‌خوراو؛ چەوساوە؛ زۆرلێکراو؛ مەزڵووم؛ ئەوی ستەمی پێ‌کراوە.

**مظلوم**[2]: صفت. ١. ستەمکێش؛ بەش‌خوراو؛ دەشەنی؛ چەوساوە؛ بڕەش ٢. [مجازی] فقیر؛ بێ‌ئازار؛ بەستەزمان.

**مظلومانه** / mazlûmāne/: [عربی/ فارسی] قید. بەبێ تاوان؛ مەزڵوومانە؛ بێ‌گوناحانە ‹مظلومانه کشته شد: بەبێ تاوان کوژرا›.

**مظلومیت** / mazlûmîyyat، ـها/: [عربی]/اسم. چەوساوەیی؛ بەش‌خوراوی؛ دۆخ و چۆنیەتی مەزڵووم بوون.

**مظنون** / maznûn/: [عربی] صفت. ١. /ـها؛ ـان؛ ـین/ بەرشک؛ بەرگومان؛ لە بەر دڕدۆنگی و شکدا ‹فرد مظنون دستگیر شد: کەسی بەرشک گیرا› ٢. بەشک؛ دڕدۆنگ؛ دارای شک و دڕدۆنگی ‹به او مظنون شدم: لێی بەشک بووم›.

**مظنه** / mazanne/: [عربی]/اسم. نرخ؛ مەزەندە؛ مەزەننە (زاراوەی بازاڕ).

▣ **مظنه دست کسی آمدن**: هاتنە دەستی کەسێک؛ مەزننە هاتنە دەس کەسێ ‹تا وضع را دیدم مظنه دستم آمد که این کار شدنی نیست: هەر بارودۆخەکەم دیت هاتە دەستم کە ئەم کارە ناکرێ›.

**مظنه کردن**: مەزننەکردن؛ نرخ پرسین؛ قیمەت‌کردن.

**مظهر** / mazhar، ـها؛ مظاهر/: [عربی]/اسم. نمانا؛ دیاردە؛ نیشانە؛ سەمبول؛ شتێ کە بە هۆی

پێوەند یان لێکچوویی لەگەڵ شتێکی‌تر، یان بە گوێرەی بڕیارێ، نیشاندەر و وەبیر خەرەوەی ئەو شتەیە، بەتایبەت نیشانەیەکی دیار و بەرچاو لە شتێکی نادیار ‹شیر مظهر شجاعت است: شێر نمانای ئازایەتیە›.

▣ **مظهر قنات:** چاوکەی کارێز؛ ئەو شوێنە کە ئاوی کارێز دەگاتە سەر زەوین.

**معاً** / ma'an/: [عربی] *قید.* پێکەوە؛ بە یەکەوە؛ لە تەک یەکا؛ پێکڤە؛ وێڕای یەک؛ پێوە؛ یۆوە.

**معابد** / ma'ābed/: [عربی] جمعِ ☜ **معبد**

**معابر** / ma'āber/: [عربی] جمعِ ☜ **معبر**

**معاد** / ma'ād, mo'ād/: [عربی] *اسم. [اسلام]* ۱. پەسڵان؛ ڕەوتی هەستانەوە؛ زیندوو بوونەوەی مردوان لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ پێڕاگەیشتن بە کار و باری ژیانی پێشوویان ۲. قیامەت؛ دنیای‌تر.

**معادل** / mo'ādel ، ـها/: [عربی] *صفت.* هاوپەرا؛ هاوسەنگ؛ بەرانبەر: ۱. بارتەقا؛ هاوکێش؛ هاوڕێژە؛ بە چۆنیەتی، چەندیەتی یان بایەخی بەرانبەرەوە ۲. هاوشان؛ هامشان؛ هاوتەراز؛ هەڤسەر؛ هاوسەر؛ بە گرینگی و وەجی یەکسانەوە.

**معادلات** / mo'ādelāt/: [عربی] جمعِ ☜ **معادله**

**معادله** / mo'ādele ، ـها؛ مُعادلات/: [عربی] *اسم.* هاوکێشە؛ هەڤکێشە: ۱. *[ریاضی]* ڕستەیەکی بریتی لە ژمارە و نیشانە، نیشاندەری بەرامبەری و هاوسەنگی دوو لایەنی ڕستەکە ۲. *[شیمی]* ڕستەیەک دوو لایەنەی بریتی لە ناوی چەند ماکی کیمیایی و نوێنەری ئاڵوگۆڕێکی کیمیاوی ۳. *[کنایی]* هاوسەنگی؛ بار و دۆخی دامەزران لە سەر بڕیارێک.

**معادل‌یابی** / mo'ādelyābî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* هاوواتادۆزی؛ کار و ڕەوتی دۆزینەوەی وشەی وا لە زمانێکدا کە لە بواری مانا و بە کار هێنانەوە هاوتای وشەی زمانی ڕەچاوکراو بێ.

**معادن** / ma'āden/: [عربی] جمعِ ☜ **معدن**

**معاذیر** / ma'āzîr/: [عربی] جمعِ ☜ **عُذر**

**معارض** / mo'ārez ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.* دژ؛ هۆگەچ؛ بەرهەڵست؛ سەرپێچ؛ نەتل؛ نەیار؛ خەریکی دژمنی و بەربەرەکانێ ‹نیروی معارض نظام: هێزی دژی ڕژیم›.

**معارضه** / mo'āreze ، ـها/: [عربی] *اسم.* دژایەتی؛ بەربەرەکانێ: ۱. دوژمنایەتی؛ نەیاری ‹معارضه با نظام: دژایەتی لەگەڵ ڕژیم› ۲. *[نامتداول]* بەرهەڵستی؛ ناسازگاری؛ ناڕەزایەتی.

**معارف** / ma'āref/: [عربی] *اسم.* ۱. جمعِ ☜ **معرفت** ۲. *[قدیمی]* فەرهەنگ.

**معارفه** / mo'ārefe/: [عربی] *اسم.* ۱. کار و ڕەوتی ناساندن ‹مراسم معارفه به عمل آمد: ڕێوڕەسمی ناساندن بەڕێوە چوو› ۲. ئاشنایەتی ‹مجلس معارفه: کۆڕی ئاشنایەتی›.

**معاریف** / ma'ārîf/: [عربی] *اسم.* ناسراوان؛ سەرشناسان؛ سەرناسان؛ ئەو کەسانەی بە باشی دەناسرێن ‹معاریف شهر: ناسراوانی شار›.

**معاش** / ma'āš, mo'āš/: [عربی] *اسم.* بژیو؛ پێژی؛ گوزەرانی ژیان ‹تأمین معاش؛ وسیلەی معاش: دابینی بژیو؛ ئامرازی بژیو›.

**معاشر**[1] / mo'āšer ، ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* هاودەم؛ هاونشین؛ ئاودەم؛ هامدەم.

**معاشر**[2]: *صفت.* خوێنگەرم؛ گەرمگر؛ خۆڕێخەر.

**معاشرت** / mo'āšerat ، ـها/: [عربی] *اسم.* هاودەمی؛ ئاودەمی؛ ئامووشە؛ ئاموشۆ؛ هات‌وچۆ؛ ئامشۆڕەفت.

**معاشرتی** / mo'āšeratî/: [عربی] *صفت. [گفتاری]* خوێنگەرم؛ گەرمگر؛ خۆڕێخەر.

**معاشقات** / mo'āšeqat/: [عربی] جمعِ ☜ **معاشقه**

**معاشقه** / mo'āšeqe ، ـها؛ معاشقات/: [عربی] *اسم.* عەشقبازی؛ دڵداری.

**معاصر** / mo'āšer ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.*

هاوچەرخ؛ هەڤچاخ؛ هاوزەمان؛ هاوچاخ: ۱. هەڤدەم؛ هەڤبەز؛ هاورۆژگار؛ هاوسەردەم ‹شیخ رضا طالبانی معاصر ناصرالدین شاه بود: شێخ ڕەزا تاڵەبانی هاوچەرخی ناسرەدین شا بوو› ۲. سەر بەم سەردەمە ‹نویسندەی معاصر؛ زمان معاصر: نووسەری هاوچەرخ؛ سەردەمی هاوچەرخ›.

**معاصی** / ma'āsî/: [عربی] جمعِ ☜ **معصیّت**

**معاضدت** / mo'āzedat ، ـها/: [عربی]/اسم. یاری؛ یارمەتی؛ هاوکاری؛ هاریکاری؛ کۆمەک؛ یاردەی.

**معاف** / mo'āf/: [عربی] صفت. بەخشراو؛ بەخشیاگ؛ مەعاف؛ لەکۆڵکەوتوو.

**معافی** / mo'āfî/: [عربی]/اسم. بەخشراوی؛ مەعافی: ۱. بار و دۆخ یان چۆنیەتی مەعاف بوون ‹معافی از خدمت سربازی: مەعافی لە خزمەتی سەربازی› ۲. [گفتاری] بروانامە یا پەڕەی مەعاف بوون ‹رفتم معافی گرفتم: ڕۆشتم مەعافیم وەرگرت›

✻ **معافیت**

**معافیت** / mo'āfîyyat/: [عربی] ☜ **معافی**

**معالج** / mo'ālec/: [عربی] صفت. دەرمانکەر؛ دەرمانیار؛ عیلاجکەر.

**معالجات** / mo'ālecāt/: [عربی] جمعِ ☜ **معالجه**

**معالجه** / mo'ālece, mā:lece ، ـها؛ معالجات/: [عربی]/اسم. چارەسەر؛ چارە؛ عیلاج؛ چار؛ دەرمان ‹کمردردم را معالجه کرد: پشتێشەکەمی چارەسەر کرد›.

**معالوصف** / ma'alvasf/: [عربی] حرف. بەو حاڵەش؛ بەم حاڵەشەوە؛ بە گشت ئەمانەوە؛ بەمەیشەو؛ بەوەشەوە کە گوترا؛ هێشتایچ؛ پێ حاڵەیچەوە ‹هرچند سابقەی خوبی نداشت، معالوصف استخدامش کردیم: ئەگەرچی ڕابردوویەکی باشی نەبوو، بەو حاڵەش دامانمەزراند›.

**معاملات** / mo'āmelāt/: [عربی] جمعِ ☜ **معامله**

**معامله** / mo'āmele ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. /معاملات/ سەودا؛ مامەڵە؛ دانوسان؛ دانوستان؛ ئاڵوویر؛ داوبسێن؛ داوبسە؛ دادوبسەت؛ ئاڵشت؛ ڕشت؛ ئاڵشوێرش؛ کڕین و فرۆشتن ‹امروز آن خانه را معامله کردم: ئەمڕۆ ئەو ماڵەم سەودا کرد› ۲. هەڵسوکەوت؛ کردەوە؛ ئاکار؛ ڕەوشت؛ کار و ڕەوتی جووڵانەوە ‹با مردم این‌طور معامله نکن!: لەگەڵ خەڵکدا وا هەڵسوکەوت مەکە!› ٤. [کنایی، گفتاری] گیزوگوڵەنگ؛ بارخانە؛ وردەواڵە؛ ئەندامی زا و زێی پیاو ‹شلوارش پاره و معامله‌اش پیدا بود: شەڵوارەکەی دڕابوو، گیزوگوڵەنگی دیار بوو›.

**معامله‌به‌مثل** / mo'āmelebemesl/: [عربی]/اسم. مامەڵەی کەس لە کەس/ کەسمان لە کەس.

**معاند** / mo'āned ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. دژ؛ دژمن؛ نەیار؛ گاڤبەر؛ نەتەل.

**معانی** / ma'ānî/: [عربی] جمعِ ☜ **معنی**

**معانی و بیان** / ma'ānî-yo-bayān/: [عربی]/اسم. [ادبیات] زانستێکی وێژەوانی کە دەپەرژێتە سەر چۆنیەتی جوان و ڕازاوە قسەکردن یان نووسین بە لەبەرچاوگرتنی بەرهەمە سەرکەوتووەکانی شاعیران و نووسەرانی گەورە.

**معاود** / mo'āved ، ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. هەڵگەڕاوە؛ ئەوەی کە لە شوێنێ هەڵگەڕابێتەوە ‹معاود عراقی: هەڵگەڕاوەی عیراقی›.

**معاودت** / mo'āvedat/: [عربی]/اسم. [ادبی] کار و ڕەوتی هەڵگەڕانەوە؛ گەڕانەوە؛ هەڵەوگەڕیان؛ ئەوەگێڵەی.

**معاوضات** / mo'āvezāt/: [عربی] جمعِ ☜ **معاوضه**

**معاوضه** / mo'āveze ، ـها؛ معاوضات/: [عربی]/اسم. ئاڵوگۆڕ؛ وارۆگۆڕ؛ هەڤگەلی؛ بەردیل؛ بەردیلی؛ گوهەڕ؛ گوهێرەک؛ کار یا ڕەوتی گۆڕینەوە؛ گۆڕانەوە؛ وارایوە؛ هەڤگوهارتن؛ گوهەڕین ‹خانه را با یک آپارتمان معاوضه کردم: ماڵەکەم لەگەڵ وارخانێک گۆڕیەوە›.

**معاون** / mo'āven ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. ۱. جێگر؛ جێگەدار؛ میرک؛ بریکار؛ دووەم پلە لە

زەنجیرەپلەی ئیداری ‹معاون وزیر؛ معاون اداره: جێگری وەزیر؛ میرکی مەزرینگە› ۲. *[حقوق]* هاودەست؛ دەستیار؛ یارمەتیدەر ‹معاون جرم: هاودەستی تاوان›.

▣ **معاون جرم:** هاو تاوان؛ یاریدەری تاوانکار؛ هاودەستی تاوانبار؛ ئەو کەسە تاوانباری یارمەتی داوە.

**معاونت** / mo'āvenat/: [عربی]/*اسم*. دەستیاری: ۱. جێگری؛ جێگرایەتی؛ میرکی؛ بریکاری؛ پیشە و پلەی میرک ۲. /ها/ هاودەستی؛ هاوکاری.

**معاهدات** / mo'āhedāt/: [عربی] جمعِ ☜ **معاهده**

**معاهده** / mo'āhede ، ـها؛ معاهدات/: [عربی]/*اسم*. ۱. پەیمان؛ پەیمانە؛ بڕیار؛ بەن‌وبەس؛ بەڵێن ۲. بڕیارنامە؛ پەیماننامە؛ بەڵێننامە؛ ڕێکەوتننامە.

**معایب** / ma'āyeb/: [عربی] جمعِ ☜ **عیب**

**معاینات** / mo'āyenāt/: [عربی] جمعِ ☜ **معاینه**

**معاینه** / mo'āyene, mā:yene ، ـها؛ معاینات/: [عربی]/*اسم*. دەویان؛ سەح؛ کار و ڕەوتی لێڕوانین و توژینەوەی شتێ یان شوێنێ، بەتایبەت توژینەوەی لەش یا بەشێک لە لەشی گیاندار بۆ دەرخستنی ئازار، نەخۆشی یان لە بەر دڵنیایی لە ساخ بوونی.

▣ **معاینەی فنی:** تاقی‌کردنی دەزگا یان ئامێرێ بۆ دڵنیایی لە ساخ بوونی.

**معبد** / ma'bad ، ـها؛ معابد/: [عربی]/*اسم*. پەرسگە؛ دێوەڵ؛ مزگان؛ مزگ؛ هورمزگ؛ جێگەی لە خوا پاڕانەوە، بەتایبەت هی جگە لە موسوڵمانان ‹معبد بودایی: پەرسگەی بوودایی›.

**معبر** / ma'bar ، ـها؛ معابر/: [عربی]/*اسم*. بوار؛ بگار؛ بوارگە؛ گوزەرگا؛ ڕێبازگە؛ ڕێگا؛ ویەر؛ ویار؛ ڕاگە؛ ڕاڕەڤ؛ گوزەر.

**معبر** / mo'abber ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/*اسم*. شرۆڤەکەر؛ شڕۆکەر؛ خەولێکدەر؛ لێکدەرەوەی خەون.

**معبود**[1] / ma'bûd/: [عربی]/*اسم*. خوا؛ خودا؛ خودێ؛ بینایی‌چاوان.

**معبود**[2]: *صفت*. پەرستراو؛ پەرسیاگ ‹خدای معبود: خودای پەرستراو›.

**معتاد** / mo'tād, mo:tād ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. هۆکارە؛ گیرۆدە؛ لۆس: ۱. ئالوودە ‹معتاد به تریاک: ئالوودەی تریاک› ۲. خۆگرتوو؛ ڕاهاتوو؛ خۆپێگرتوو ‹معتاد به مطالعه: هۆکارەی خوێندنەوە›.

**معتبر** / mo'tabar, mo:tabar/: [عربی] *صفت*. ۱. جێ‌متمانە؛ بە ئیتوار؛ جێ‌بڕوا؛ جێ‌باوەڕ؛ بە بڕشت؛ جێگەی متمانە ‹تاجر معتبر؛ خبر معتبر: بازرگانی جێ‌بڕوا؛ هەواڵی جێ‌باوەڕ› ۲. *[قدیمی]* گرینگ ‹پل معتبری ساخته بودند: پردێکی گرینگیان دروست کردبوو›.

**معتدل** / mo'tadel, mo:tadel/: [عربی] *صفت*. ۱. فێنک؛ هنک؛ هۆنک؛ هێنک؛ هوون؛ هووینک؛ هوونک؛ هینگ؛ فوونکی؛ فۆنکایی؛ نە گەرم نە سارد ‹آب و هوای معتدل: ئاو و هەوای فینک› ۲. میانەڕۆ؛ مامناوەندی ‹سیاستمدار معتدل: ڕامیاری میانەڕۆ›.

**معترض** / mo'tarez, mo:tarez ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. بەرهەڵست؛ بەرتەکداو؛ بەرپەرچدەر؛ لێوەستاو؛ ڕەخنەگر ‹او به این کار معترض است: ئەو بەرهەڵستی ئەم کارەیە›.

**معترضه** / mo'tareze, mo:tareze/: [عربی] ☜ جملەی معترضه، **جمله**

**معترف** / mo'taref, mo:taref/: [عربی] *صفت*. موکوڕ؛ مکوڕ؛ مقیر؛ درکێن؛ دان‌پیانەر؛ پێ‌لێنەر؛ ددان‌پێدانەر؛ دۆخی پێ‌هاتن و هەڵە یان تاوانباری خۆ گرتنە ئەستۆ ‹او به گناهش معترف است: بە گونای خۆی موکوڕ هاتووە›.

**معتزله** / mo'tazele/: [عربی]/*اسم*. موعتەزیلە؛ ڕێبازێکی کەلامی و فەلسەفی کە لە سەدەی دووهەمی کۆچیەوە لە ناو موسوڵماناندا سەری هەڵدا و جەخت دەکاتە سەر عەقڵ و بایەخدان

به بەڵگە، سەربەست بوونی مرۆڤ و خولقاو بوونی قورئان.

**معتزلی** / mo'tazelî/: [عربی] *صفت.* موعتەزیلی: ۱. سەر بە موعتەزیلە ‹افکار معتزلی: بیر و ڕای موعتەزیلی› ۲. /ـها؛ ـان/ هۆگر و شوێنەڕای موعتەزیلە.

**معتقد** / mo'taqed, mo:'taqed ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.* بروامەند؛ باوڕدار؛ برِوادار: ۱. بەبڕوا؛ خاوەنباوڕ ‹شخص معتقد به اصالت ماده: کەسی بروامەند بە ڕەسەنی ماک› ۲. بە ئیمان ‹معتقد به اسلام: بروادار بە ئیسلام›.

**معتقدات** / mo'taqedāt, mo:taqedāt/: [عربی] جمعِ ☜ **عقیده**

**معتمد** / mo'tamed, mo'tamad ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/*اسم.* جێباوڕ؛ جێمتمانە؛ ڕاست و ئەمین؛ باوڕپێکراو؛ جێبڕوا و دڵنیایی خەڵک ‹معتمد محل: جێباوەڕی گەڕەک›.

**معتنابه** / mo'tanābeh/: [عربی] *صفت.* زۆر و زەبەند؛ چاوگر؛ مشەمەر؛ فرە ‹مقدار معتنابە: ڕادەی زۆر و زەبەند›.

**معجر** / ma'car ، ـها/: [عربی]/*اسم.* *[گفتاری]* مەعجەر؛ مەعجەرە؛ پێکهاتەیەک لە بەرد، چێو یان کانزا بۆ بەرهێوان یان لە پەنای پلیکان: **محجر**

**معجز** / mo'cez, mo:cez ، ـها/: [عربی]/*اسم.* *[گفتاری]* پەرجوو؛ پەرجۆ؛ مۆجزە.

**معجزات** / mo'cezāt, mo:cezāt/: [عربی] جمعِ ☜ **معجزه**

**معجزآسا** / mo'cezāsā, mo:cezāsā, mo'cez'āsā/: [عربی/ فارسی] *صفت.* *[ادبی]* پەرجۆئاسا؛ مۆجزاسا؛ زۆر سەیر، بەتایبەت لە بواری هەڵکەفتی ڕوودان ‹نجات معجزەآسا: پیروزی معجزەآسا: ڕزگاری پەرجوئاسا؛ سەرکەوتنی مۆجزاسا›.

**معجزه** / mo'ceze, mo:ceze ، ـها؛ معجزات/: [عربی]/*اسم.* پەرجۆ؛ پەرجوو؛ مۆجزات؛ مۆجزە؛ نووازە؛ مووزات: ۱. کاری زۆر سەیر و سەمەرە کە لە پێغەمبەرانەوە بینراوە و نیشاندەری دەستڕۆشتوویی هێزی ئاسمانی لە ژیانی مرۆڤە ۲. دیاردە، شت یان کارێکی زور سەیر و نائاسایی.

**معجون** / ma'cûn/: [عربی]/*اسم.* ماجووم؛ مەعجوون: ۱. /ـها/ دەرمانێکی خۆراکی و هێزدەر، پتر وەکوو مرەبا یان هەڵوا کە لە تێکەڵاوکردنی چەند ماک بەرهەم دێ ۲. چەشنێ خۆراک بە شێوەی تێکەڵاوی شیلەی خورما، شیر، گوێز، پستە، بادام، کونجی و نارگیل و هەنگوێن.

**معدل** / mo'addel ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ناوین؛ ناڤنج؛ ناوگین؛ بەرئەنجام؛ کۆئەنجام؛ ژمارەیەک کە لە کۆکردنەوەی بۆ وێنە دە ژمارە و ئەمجار دابەشکردنی سەرجەم بە سەر ژمارەی دەدا بەرهەم دێ.

**معدل النهار** / mo'addelonnahār/: [عربی]/*اسم.* هەر کام لەو دوو شۆنکاتە لە ساڵدا کە درێژایی شەو و ڕۆژ وەک یەک دێتەوە (ئاخر شەوی زستان و دوایین ڕۆژی هاوین).

**معدن** / ma'dan, ma:dan ، ـها؛ معادن/: [عربی]/*اسم.* کان؛ جان؛ کاراک؛ کارە؛ کانگا؛ کانگە؛ ناوک؛ ناوکە؛ کەن؛ مەڵبەن؛ مەڵبەند؛ کەند: ۱. کۆگای کانەگەلی سروشتی ۲. ڕەهەند و دالانی کەنراو لە ژێر زەویدا بۆ دۆزینەوە و دەرهێنانی کانە ۳. *[مجازی]* خەزێنە؛ هەمان؛ شوێنێ کە بە فراوانی شتێکی لێ بێ ‹معدن ماهی؛ معدن علم: کانی ماسی؛ کانی زانست›.

◘ **معدن زغالسنگ:** کەمران؛ کانی بەردەخەڵووزە.

**معدن سنگ:** کەرخانە؛ کانەبەرد؛ کانەکوچک؛ کانی بەرد لێ هەڵکەندن.

**معدن گچ:** گەچینە؛ کانی گەچ؛ کانەگەچ.

**معدن نمک:** خوێڵێن؛ خواڵێن؛ نمەکلۆ؛ کانی

خویّ.

**معـدنچی** / ma'dančî, ma:dan- ، ـها؛ ـان/: [عربی/ ترکی]/اسم. کانکەن؛ کرێکاری نێو کان.

**معـدنکار** / ma'dankār, ma:dan- ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. کانکار؛ کانەوان؛ ئەوەی بە کار و باری کانگاوە دەپەرژێ (وەک کانکەن، ئەندازیار یان خاوەنی کان).

**معـدنکاری** / ma'dankārî, ma:dan-/: [عربی/ فارسی]/اسم. کانکاری؛ کانەوانی؛ سەرجەم کار و باری دانەوە، دەرهێنان و کەڵک وەرگرتن لە کاراک.

**معـدنی** / ma'danî, ma:danî/: [عربی] صفت. کانی؛ کانگەیی: ۱. کانزایی؛ لە کاندا بەرهەم هاتوو ‹فرآوردەهای معدنی: بەرهەمگەلی کانزایی› ۲. سەر بە کان ‹مادەی معدنی: ماکی کانی›.

◙ **آب معدنی** ☜ **آب**

**معـدود** / ma'dûd, ma:dûd/: [عربی] صفت. تاکوتووک؛ زۆر کەم؛ کەمژمار ‹معدودی فرار کردند: تاکوتووکێک هەڵاتن›.

**معدوم** / ma'dûm/: [عربی] صفت. ۱. تووناببوو؛ تەفروتوونا؛ تیاچوو؛ لەناوچوو؛ لەبەینچوو؛ فەوتاو ‹آن همە کتاب معدوم شد: ئەو هەمکە کتێبە تەفروتوونا بوون› ۲. ئێعدام کراو؛ تێدابراو؛ کوژراو ‹افسر معدوم: ئەفسەری ئێعدامکراو›.

**معـده** / me'de, me:de/: [عربی]/اسم. گەدە؛ گەدگ؛ گەدک؛ گەدێ؛ گەیە؛ گرگ؛ ورگ؛ گیپاڵ؛ هوور؛ کرش؛ سیق؛ مەن؛ ئاشک؛ هۆلمان؛ ماعور؛ عوور؛ ئوور؛ عورگ؛ حورگ؛ مەعدە؛ کیسەی ماسولکەیی نێو کۆندامی هەرسەک، لە نێوان سورانچک و ڕیخۆڵەدا کە خۆراک دوای قووت دان دەڕژێتە ناوی.

**معدی** / me'dî/: [عربی] صفت. ورگی؛ گەدەیی؛ گەدگی؛ ئاشگی؛ هۆلمانی؛ سەر بە گەدە ‹بیماری معدی: نەخۆشی ورگی›.

**معذالك** / ma'zālek, ma:zālek/: [عربی] حرف. بەم حاڵەشەوە؛ بەو حاڵەش؛ هێشتایچ؛ بەمەیشەوە؛ پینەیچەوە ‹معذالک بهتر است با او مشورتی بکنید: بەم حاڵەشەوە باشترە ڕاوێژێکی لەگەڵدا بکەن›: **معهذا؛ معذلک**

**معذب** / mo'azzab/: [عربی] صفت. نارەحەت؛ ئاراو ‹از شرکت در این گونە مجالس معذب میشود: لە بەشدار بوون لەم چەشنە کۆڕانەدا نارەحەت دەبێ›.

**معذرت** / ma'zerat, ma:zerat ، ـها/: [عربی]/اسم. داوای لێبووردن؛ مەعزەرەت؛ عوزر ‹از تأخیرم معذرت میخواهم: لە بەر دێر هاتنم داوای لێبووردن دەکەم›.

**معذرتخـواهی** / ma'zeratxāhî, ma:zerat-/: [عربی/ فارسی]/اسم. *[گفتاری]* داوای لێبووردوویی؛ عوزرخوازی؛ کاری داوای لێبووردن کردن.

**معذلك** / ma'zālek/: [عربی] ☜ **معذالک**

**معـذور** / ma'zûr, ma:zûr/: [عربی] صفت. ۱. بەعوزر ۲. بێدەسەڵات؛ ناتەوان ‹بیمار معذور است: نەخۆش بێدەسەڵاتە› ۳. دۆخی ژن لە کاتی نەخۆشی مانگانەیدا.

**معذوریت** / ma'zûrîyyat, ma:zûrîyyat ، ـها/: [عربی]/اسم. چۆنیەتی بەعوزر بوون.

**معراج** / me'rāc, me:rāc/: [عربی]/اسم. میعراج: ۱. *[اسلام]* کار و ڕەوتی چوون بۆ ئاسمان و گەیشتنە لای خودا، بەتایبەت لەمەڕ پێغەمبەری ئیسلامەوە ۲. *[کنایی]* عورووج؛ ڕەوتی بەرز بوونەوە و هەڵچوون ۳. پلیکانە؛ پەیژە؛ سەرخەرە؛ ئامێر و هۆی هەڵچوون و سەرکەوتن.

**معـرب** / mo'arrab/: [عربی] صفت. عەرەبیکراو ‹جرجان معرب گرگان است: جورجان عەرەبیکراوی گورگانە›.

**معرب** / mo'rab/: [عربی] صفت. موفرکدار؛ بە سەرە و ژێرە و بۆرە.

**معرض** / ma'raz, ma:raz/: [عربی]/اسم. پێشانگە؛ پیشانگە؛ ڕانگە؛ بەرچاو؛ نمایشگا؛ جێگەی ڕانان.

◙ **به معرض چیزی گذاشتن**: وە بەر شتێ ڕانان؛

وەبەر شتێ نان؛ وە بەر شتێ خستن ‹خانه را به معرض فروش گذاشتیم: ماڵەکەمان دانا بۆ فرۆش›.

در معرض چیزی بودن: خەریک شتێ بوون؛ لە بەر کارتێکەری شتێکا بوون ‹خانه در معرض ویرانی است: ماڵەکە خەریکە برووخێ›.

در معرض چیزی قرار دادن: وە بەر شتێ خستن؛ خستنە بەر شتێ ‹خود را در معرض خطر قرار داد: خۆی خستە بەر مەترسی›: در معرض چیزی گذاشتن

در معرض چیزی قرار گرفتن: کەوتنە بەر شتێ ‹با آغاز جنگ شهرهای کشور در معرض حملەی دشمن قرار گرفت: بە دەسپێکردنی شەڕ شارەکانی وڵات کەوتنە بەر هێرشی دژمن›: در معرض چیزی واقع شدن

در معرض چیزی گذاشتن ☜ در معرض چیزی قرار دادن

در معرض چیزی واقع شدن ☜ در معرض چیزی قرار گرفتن

**معرف** / mo'arref ، ـها/: [عربی]/اسم. شناس؛ بناس؛ ناسێنەر: ۱. /ان؛ ـین/ ئەوەی کەسێک دەناسێت و دەتوانێ سەبارەت بەو زانیاری بدا ‹دو نفر معرف معرفی کنید!: دوو شناس ناو بەرن!› ۲. *[شیمی]* ناسێنە؛ ئەندیکاتور؛ ماکێکی کیمیایی کە بە پای ڕەنگیدا هەبوون یان نەبوونی ماکیتر دەردەخا ۳. *[منطق]* شتێکی ئاشکرا و بێقسە کە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی شتێکی نادیار.

**معرفت** / ma'refat, ma:refat ، ـها؛ معارف/: [عربی]/اسم. ۱. ناسیاری؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی ناسینی شتێ بە هوی ئاشنا بوونی لە ڕێگەی ئەزموون یان پێوەندیەوە ۲. زانست؛ بەرهەمی ئەم جۆرە ناسینە ۳. زانست؛ سەردەرچوویی لە زانست، فەن یان هونەرێک ٤. زانست؛ بەرهەمی ئەم ئاشنایەتیە ٥. ناسیاری؛ زانیاری؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی تێگەیشتن لە ڕاستەقینە ‹معرفت علمی؛ معرفت شهودی: ناسیاری زانستی؛ زانیاری خویایی› ٦. ئاگاداری؛ زانیاری ۷. *[گفتاری]* ماریفەت؛ ئاشنایەتی لەگەڵ فەرهەنگی پەسەندکراوی کۆمەڵ و بە گوێرەی ئەوە جووڵانەوە ‹اگر معرفت داشتی رفیقت را جا نمی‌گذاشتی: ئەگەر ماریفەتت هەبوایە هاواڵەکەت بەجێ نەدەهێشت›.

**معرفت‌شناسی** / ma'refatšenāsî, ma:refat- /: [عربی/ فارسی] ☜ **شناخت‌شناسی**

**معرفه** / ma'refe /: [عربی] ☜ اسم معرفه، **اسم**

**معرفی** / mo'arrefî /: [عربی]/اسم. کار و ڕەوتی ناساندن.

◘ معرفی شدن: ناسران؛ ناسیان؛ ئەژناسیەی ‹امروز وزیران تازه به مجلس معرفی شدند: ئەمڕۆ وەزیرانی نوێ بە پارلەمان ناسران›.

معرفی کردن: ناساندن؛ پێناساندن؛ پێناسین ‹خواهشمند است خودتان را معرفی کنید: داوا دەکەین خۆتان بناسینن›.

**معرفی‌نامه** / mo'arrefînāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پێناسنامە؛ نووسراوەیەکی ڕەسمی کە شایەدی لە سەر کەسایەتی، لێهاتوویی یان ڕاسپێراوی کەسێ دەدا.

**معرق** / mo'arreq ، ـها/: [عربی] *صفت.* ئارەقپێکەر؛ ئارەقدەردەر؛ بە تایبەتمەندی ئارەق پێ دەردانەوە.

**معرقکاری** / mo'arraqkārî /: [عربی/ فارسی]/اسم. موعەڕەقکاری: ۱. کار و ڕەوتی تاشین و پێکەوە نانی تیکەی چێو یان کاشی بۆ داهێنانی نەخشێکی جوان ۲. /ها/ نەخشێ کە لەو کارە بەرهەم دێت.

**معرکه**[1] / ma'reke, ma'rake, ma:reke ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. شەڕگە؛ شەڕگا؛ هێل؛ حەچەڵ؛ مارەکە؛ گۆڕەپانی شەڕ و لێکدان ۲. مەعرەکە؛ شانۆی سیرکئاسای ناوگەڕەکان (وەک مار گرتن و زۆرەزمێ و...) ۳. مەعرەکە؛ شوێنی بەڕێوە

چوونی ئەو شانۆیانە ٤. شوێنی جەنجاڵ و جێی مەترسی.

▣ **معرکه گرفتن**: مەعرەکە خستنە ڕێ؛ شانۆی وەکوو سیرک بەڕێوە بردن لە ناو کووچە و کۆلانان.

**وارد معرکه شدن** ☜ **وارد**

**معرکه**[2]: *صفت. [گفتاری]* سەیر؛ سەمەرە.

▣ **معرکه کردن**: کاری سەیر و سەمەرەکردن.

**معرکـه‌گیـری** / ma'rekegîrî, ma'rake-, ma:reke- ، ـها/: [عربی/فارسی]/اسم. کار و ڕەوتی مەعرەکە خستنە ڕێ. هەروەها: **معرکه‌گیر**

**معـروض** / ma'rûz/: [عربی] صفت. ڕانراو؛ پیشاندراو؛ ڕۆنراو؛ ڕۆکراو؛ ئرمانیا؛ وە بەر چاو خراو.

▣ **معروض داشتن**: ۱. *[نامتداول]* ڕانان؛ پێشاندان؛ ڕۆنان؛ ئرمانەی ۲. پێشکەش کردن؛ گوتن؛ وتن ‹گزارش آن را به ترتیب زیر معروض می‌دارد: گوزارشەکەی بەم شێوە پێشکەش دەکرێ›.

**معروف** / ma'rûf/: [عربی] صفت. ناسراو؛ ئەژناسیا: ۱. ناسیاو ‹این خیابان معروف است، از هر کسی بپرسی نشانت می‌دهند: ئەم شەقامە ناسراوە لە هەر کەس بپرسی نیشانت ئەدا› ۲. بەناوبانگ؛ ناودار؛ دەنگین؛ ناوبەدەر؛ بەرزەناو؛ سەرناس ‹نویسندەی معروف: نووسەری بەناوبانگ›. هەروها: **معروف بودن؛ معروف شدن؛ معروف کردن**

**معروفـه** / ma'rûfe ، ـها/: [عربی]/اسم. ژنی داوێن‌پیس کە تێکەڵی دەوڵەمەندان دەبێ.

**معروفیـت** / ma'rûfîyyat/: [عربی]/اسم. ۱. بەناوبانگی؛ ناسیاوی؛ ناوداری؛ ناوبەدەری؛ ناسراوی؛ سەرناسی ‹دلیل معروفیت او چیست؟: هۆی بەناوبانگی ئەو لە چیدایە؟› ۲. /ـها/ ناوبانگ؛ دەنگان؛ دەنگ ‹خیلی معروفیت پیدا کرد: ناوبانگێکی زۆری داخست›.

**معزز** / mo'azzaz/: [عربی] صفت. خۆشەویست؛ ئازیز.

**معزول** / ma'zûl/: [عربی] صفت. (لە کار) لابراو؛ لەکارلادراو؛ لەکارکریاگ؛ دەرکراو؛ کاربەدەستی وەلانراو ‹مدیر معزول: بەرپرسی لابراو›.

**معسر** / mo'ser ، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. هەژار؛ نەدار؛ دەستەنگ؛ بەلەنگاز؛ فەقیر.

**معشـوق** / ma'šûq ، ـها/: [عربی]/اسم. گراوی؛ خۆشەویست: ۱. پیاوێ کە ژنێک خۆشی ئەوێ ۲. دڵبەر؛ دڵدایی؛ ژنێ کە پیاوێ عاشقیەتی.

**معشـوقه** / ma'šûqe ، ـها؛ ـگان/: [عربی]/اسم. ۱. لەیل؛ گراوی؛ دڵبەر؛ دلبەر؛ مەحبووب؛ خۆشەویست؛ یار؛ مەحبووبە؛ دڵبەند؛ دڵدایی؛ کچ یا ژنێ کە ئەویندارى بن ۲. ماشقە؛ ماشکە؛ واشتا؛ مساوێ؛ دۆستی مێوینە؛ ژنێ کە وێڕای پیاوێ بێجگە مێردەکەی ئەوینداری بکا.

**معصره** / me'sare/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* هێسل؛ گوشینگە؛ جێگەی ترێ گووشین.

**معصوم**[1] / ma'sûm ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. *[شیعه]* پێغەمبەر، فاتمی کچی و دوازدە ئیمام.

**معصوم**[2]: *صفت*. پاک؛ پاک و پوار؛ مەعسووم؛ بەهرەمەند لە پاکی بە هۆی دوورگرتن لە گوناه .

**معصومانه**[1] / ma'sûmāne/: [عربی/ فارسی] صفت. پاک؛ بێ‌گوناهانە؛ وەک مەعسووم ‹قیافەی معصومانه‌ای داشت: سیمایەکی پاکی بوو›.

**معصـومانه**[2]: *قید*. ڕاست و پاک؛ بێ‌گوناهانە ‹معصومانه گفت من برداشتم: ڕاست و پاک گوتی من هەڵمگرت›.

**معصـومیت** / ma'sûmîyyat ، ـها/: [عربی]/اسم. بێ‌گوناهی؛ پاکی؛ بێ‌تاوانی ‹معصومیت از سر تا پایش می‌بارید: بێ‌گوناهی لە سەر تا پای ئەباری›.

**معصـیت** / ma'siyat, ma:siyat ، ـها؛ معاصی/: [عربی]/اسم. تاوان؛ گوناه ؛ سووچ.

**معضل** / mo'zal, mo:zal ، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. کۆسپ؛ گرفت؛ تەگەرە؛ بەلا؛ گیر ‹تأمین هزینەی بیمارستان برایمان معضل بزرگی شده بود: دابینی

خەرجی نەخۆشخانە ببوە گرفتێکی گەورە بۆمان›.

**معطـــر** / mo'attar/: [عربـی] صـفت. بۆنخـۆش؛ عەترازن.

**معطـــل** / mo'attal, ma'tal/: [عربـی] صـفت. ١. ماتڵ؛ مەحتـەڵ؛ دەسەوسـان؛ دەستەوسـان؛ دەستەوستان؛ بێ‌کار بە هۆی نەبوونی ئـامرازەوە ‹ماشین نبود و یک ساعت در خیابان معطل مانـدم: ماشین نەبوو، سەعاتێک لـە شـەقامدا مـاتڵ بـووم› ٢. ماتڵ؛ چاوەڕوان؛ چاوەنۆڕ؛ چاوەڕێ؛ چاڤـنێر؛ چەمەڕا ‹یک ساعت معطل ماشین شـدم: سـەعاتێک چاوەڕوانـی ماشین بووم› ٣. داماو؛ تێداماو؛ تێماو؛ دامـاگ ‹در جـوابش معطـل مانـدم: بـۆ وەڵامـی داماوم›.

**معطلی** / mo'attalî, ma'talî ، ـها/: [عربـی] اسم. ١. ماتڵـی؛ مەحتـەلی؛ تەمایـەری؛ چاڤـنێری ‹ببخشید که باعث معطلی شـما شـدم: ببـوورن بوومـە هۆی ماتڵیتان› ٢. دێرهـات؛ دواکـەوت؛ درەنـگ ‹خراب شدن ماشین و دوری راه باعث معطلی مـن شـد: خراپ بوونی ماشین و دووری ڕێگە بوو بە هۆی ئـەو دێرهاتـنەم›.

**معطـــوف** / ma'tûf/: [عربـــی] صـــفت. [ادبـــی] هەڵگەڕاوە؛ گەڕاوە؛ باداوە (بۆ لای شتێ).

▣ معطوف بـە سـابقه بـودن: هەڵـگەڕانەوە سـەر پێشینە؛ پێشینەدار بوون ‹عمـل او معطـوف بـە سابقه اسـت: کردەوەکـەی هەڵـدەگەڕێتەوە سـەر پێشینەی›.

معطـوف کـردن: بـڕین؛ ئـاوڕ لـێدانـەوە؛ لا لێ‌کردنەوە ‹همه توجهش را معطوف برادرش کرده بود: هەموو هۆش و بیری بڕیبووە براکەی›.

**معظم** / mo'azzam/: [عربی] صفت. مەزن؛ مـازن؛ گەورە؛ پایەبەرز.

**معظم** / mo'zam/: [عربی] صفت. بەشکۆ؛ گـەورە؛ شکۆدار ‹کاخ معظم: کۆشکی بەشکۆ›.

**معظـمـلـه** / mo'azzamo(n)lah/: [عربـی] ضـمیر. بەڕێزیان؛ وان؛ ئەوان (لە کاتی ڕێز نان لە پیـاو بـە کار دێ) ‹معظمله فرمودند: بەڕێزیان فەرموویان›.

**معظم لها** / mo'azzamo(n)lahā/: [عربـی] ضـمیر. بەڕێزیان؛ مە زنیان؛ وان؛ ئەوان (لە کاتی ڕێزنیـان لە ژن بە کار دێ).

**معقد** / mo'aqqad/: [عربی] صفت. دژوار؛ ئاریشـە؛ پڕگرێ؛ سەخت.

**معقـــول** / ma'qûl, ma:qûl/: [عربـــی] صـــفت. گونجاو: ١. ژیـر؛ لـەبار؛ بـەڕێ و جـێ؛ بـەجێ؛ ئەوی ئاوەز پەسندی بکا ‹ کار معقول؛ آدم معقـول: کاری گونجاو؛ مرۆڤی ژیر› ٢. /ـات/ ئەو چـەمک و باسانەی کە ئـاوەز لێـی تێـدەگا (وەک چـەمکی فەلسەفی و بیرۆکەیی).

**معقـولات** / ma'qûlāt/: [عربـی] اسم. ١. [فلسـفه] ئەوی هەسـتی پـێ بکـرێ ٢. [گفتاری] قسـە و باسی وا کە هەموو کەسێکی تێ‌نەگا.

▣ وارد معقولات شدن ☜ وارد

**معکـــوس** / ma'kûs/: [عربـی] صـفت. ئـاوەژوو؛ چەپەوانە؛ پێچەوانە؛ بەراوەژوو؛ بـەراوەژۆ؛ واژی؛ بەرواژی؛ بەراوەژی؛ تەرسە؛ چەواشـە؛ چوارشـی ‹تصـویر در آینـە معکـوس اسـت: وێنـە لـە ئاوێنـەدا پێچەوانەیە›.

**معلق**[1] / mo'allaq/: [عربی] اسم. تـۆمپز؛ مەلـەق؛ تەقڵە؛ مەقولات؛ سـەرمەقولات؛ سـەرمەقوتانی؛ جقڵمبە؛ لە هەوادا هەڵسووڕان.

▣ معلق زدن: مەلەق لێدان؛ سەرمەقولات بردن؛ سـەرمەقولتان دان؛ سـەرمەقوتان پێکـەی؛ قلۆزان؛ محەللەق لێدان؛ تەقلە لێدان.

**معلـق**[2]: صفت. ١. تـۆمپز؛ ئـاوێزان؛ هەڵواسـراو؛ هەڵاوەسـرای؛ دولـویز؛ ئەڵـخ؛ هـادار؛ میـوەک؛ شـۆڕەوبووگ؛ شـندل؛ داهێنـدراو؛ بـەل؛ دوڕ؛ بەلەچـەک؛ دەنگلـەویز؛ دارەلـووس؛ دارەڵـۆز؛ داهـێلاو؛ ئاڵـۆچیا؛ داڵـەقاو؛ داڵـۆچکە؛ دەلاڵـەکۆچکێ ٢. [مجـازی] هەڵپەسـاردوو؛ هەڵپەسـاردە؛ هەڵپەسـێراو؛ هەڵپەسـارتە؛ بـۆ ماوەیێ بێکارکراو.

▣ **معلق شدن**: ۱. هەڵواسران؛ شۆڕەوکران؛ داهێڵران؛ ئەرەئاڵۆچیەی؛ داهێندران ۲. *[مجازی]* هەڵپەسێران؛ بۆ ماوەیێ لەکارکران. هەروەها: **معلق کردن**

**معلق گذاشتن**: *[مجازی]* هەڵپەساردن؛ بۆ ماوەیەک داخستن.

**معلق ماندن**: ۱. ئاوێزان مان؛ داهێڵران؛ بەلەچەک مان؛ دالەقاو مان؛ دارەلووس مان ۲. *[مجازی]* بە داخراوی مانەوە؛ بە هەڵپەسێراوی مان.

**معلم** / mo'allem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم*. مامۆستا؛ مامۆسا؛ فێرکار؛ هەڤۆتکار؛ سەیدا؛ ڕاهێن؛ هێندار؛ وانەبێژ؛ دەرسبێژ؛ هینکار؛ هینکەر؛ هێکەر؛ هێکار؛ هینەر؛ ئەو کەسە خەریکی دەرس وتنەوە و ڕاهێنانە.

▣ **معلم خصوصی**: مامۆستای تایبەتی؛ سەیدای تایبەتی؛ مامۆستایێ کە لە دەرەوەی قوتابخانە بە قوتابیانی دەرس دەڵێتەوە.

**معلم سرخانه**: مامۆستای سەرماڵ؛ سەیدای سەرماڵ؛ وانەبێژێ کە لە ماڵی قوتابیەکەیدا دەرسی پێ دەڵێتەوە.

**معلمه** / mo'alleme ، ـها/: [عربی] *اسم*. *[نامتداول]* کچ یا ژنێ کە مامۆستا بێ.

**معلمی** / mo'allemî/: [عربی] *اسم*. مامۆستایی؛ مامۆسایی؛ سەیدایی؛ هێنداری؛ هەڤۆتکاری؛ وانەبێژی؛ فێرکاری؛ هێکاری؛ هینکاری؛ هینکەری ‹مدتی هم به معلمی مشغول بود: ماوەیەکیش خەریک مامۆستایی بوو›.

**معلول**[1] / ma'lûl ، ـها/: [عربی] *اسم*. ۱. ـان؛ ـین/ نوقسان؛ نقوستان؛ سەقەت؛ سەکەت؛ مقرۆ؛ کەمئەندام (وەک کوێر؛ کەڕ؛ کوچ؛ شەل) ۲. بەرهۆ؛ بەرهەمی هۆ ‹از معلول می‌توان به علت پی برد: لە بەرهۆوە دەکرێ هۆ بدۆزینەوە›.

**معلول**[2]: *صفت*. ۱. مقرۆ؛ کەمئەندام؛ کەمەندام؛ بە یەک یان چەند ئەندامی لەکارتە یا ناتەواوەوە ‹معلول جنگی: کەمئەندامی شەڕ› ۲. شۆنهات؛ بەرهۆ؛ هۆدار؛ دارای هۆ ‹بسیاری از ناهنجاری‌های جامعه معلول فقر است: زۆرێ لە ناتەباییەکانی کۆمەڵگا شۆنهاتی هەژاریە›.

**معلولیت** / ma'lûlîyyat ، ـها/: [عربی] *اسم*. مقرۆیی؛ کەمئەندامی؛ کەمەندامی؛ بار و دۆخ یان چۆنیەتی کەمئەندام بوون ‹به دلیل معلولیت قادر به انجام کار نیست: بە هۆی کەمەندامیەوە ناتوانێ کار بکا›.

**معلوم** / ma'lûm/: [عربی] *صفت*. ۱. دیار؛ ئاشکرا؛ ڕۆشن؛ زانراو؛ خویا؛ مالوم؛ زەق ‹معلوم است که نمی‌خواهی کار بکنی؛ تکلیف تو هم که معلوم شد: دیارە ناتەوێ کار بکەی؛ ئەرکی تۆش ڕوشن بۆوە› ۲. ☜ فعل معلوم، **فعل**

▣ **معلوم شدن**: دەرکەوتن؛ ڕوون بوونەوە.

**معلوم کردن**: دەرخستن؛ ڕۆشن کردنەوە.

**معلوم کسی کردن**: بە کەسێک فاماندن؛ کەسێ تێگەیاندن.

**معلومات** / ma'lûmāt/: [عربی] *اسم*. زانیاری؛ سەرجەمی هەموو جۆرە ئاگاداریەک بەتایبەت ئەوەی بە خوێندنەوە دەس کەوتبێ ‹آرام معلومات خوبی داشت: ئارام زانیاری باشی هەبوو›.

**معلوم‌الحال** / ma'lûmolhāl ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت*. ۱. بە بار و دۆخی ناسراو و زۆرتر نالەبارەوە ۲. *[مجازی]* ناوزڕاو؛ بەدناو؛ ناڤنۆ؛ نامڤەت ‹عده‌ای معلوم‌الحال گردهم‌آیی دانشجویان را برهم زدند: بڕێ ناوزڕاو کۆبوونەوەی قوتابیانیان تێک دا›.

**معما** / mo'ammā ، ـها/: [عربی] *اسم*. ۱. لەگەز؛ لەغەز؛ لیچار؛ مەتەڵ؛ چمام؛ قاف؛ پەردەک؛ مەتەڵۆکە؛ مەتەڵۆک؛ مەتهەڵۆک؛ تشتانۆک؛ چمامک؛ بابەت یان گەلالەیێ کە وەک پرسیارێک دەگوترێ و بەرپرس دەبێ ناوی شتێ، کەسێ یان بابەتێکی تێدا بدۆزێتەوە، بۆ هەڵسەنگاندنی هۆش و وریایی ۲. دۆخ یان ڕووداوێک کە تێگەیشتنی دژوارە ‹معمای قتل

جوان سنندجی: لەگەڕی کوڕانی لاوی سنەیی›.

**معمار** / me'mār ، ـها، ـان/: [عربی]/اسم. نژیاروان؛ نژیارڤان؛ ئاڤاهی‌ساز: ۱. کەسێ کە گەلالەی خانووبەرە دەڕێژێ و بۆ کردنەوەی سەرپەرستی دەکا ۲. بیناساز؛ کەسێ کە بە ئەزموونی خۆیەوە گەلالەی خانووبەرە دەڕێژێ و کارەکە بەڕێوە دەبا.

**معماری** / me'mārî/: [عربی]/اسم. نژیارڤانی؛ نژیاروانی؛ ڕێکار یان هونەری گەلالە دارشتن و کردنەوەی بینا، بەتایبەت ماڵ و خانووبەرە.

**معمر** / mo'ammar ، ـین/: [عربی] *صفت. [ادبی]* پیر؛ بەسالاچوو؛ دانساڵ؛ دانعومر؛ تەمەندرێژ؛ بە تەمەن ‹مرد معمری در آنجا بود: پیاوێکی بەسالاچووی لێ بوو›.

**معمم** / mo'ammam ، ـین/: [عربی] *صفت.* ۱. مێزەر بە سەر؛ مێزەرە لە سەر؛ سەر بە مێزەرە؛ شاشک بەسەر؛ سەرپێچ بە سەر ۲. مەلا؛ خاوەن کار یان پلەی مەلایەتی.

**معمور** / ma'mûr/: [عربی] *صفت.* ئاوەدان؛ ئاوا؛ ئاڤا؛ قەوغا؛ ئاڤەدان؛ ئاوان.

**معمول** / ma'mûl, ma:mûl/: [عربی] *صفت.* ۱. بەڕێوەچوو؛ کراو ‹مطابق سنوات قبلی معمول شده است: بە گوێرەی ساڵانی پێشوو بەڕیوە چووە› ۲. باو؛ داب؛ دام و دەستوور؛ نەریت ‹معمول است که زمین‌ها را در پاییز شخم می‌زنند: وا باوە لە پاییزدا زەوی و زار دەکێڵن›.

**معمولاً** / ma'mûlan/: [عربی] *قید.* پتر؛ زۆرتر؛ فرەتر؛ زیاتر؛ بە شێوەی ئاسایی؛ لە دۆخی ئاسایی ‹معمولاً ناهار را در خانه می‌خورم، مگر کاری پیش بیاید: پتر لە ماڵەوە فراوین دەکەم، مەگین کارێ بێتە ڕێم›.

**معمولی** / ma'mûlî, ma:mûlî ، ـها/: [عربی] *صفت.* ئاسایی: ۱. بە بار و دۆخ یان چۆنیەتیەکەوە کە باوە ‹در همان وقت معمولی آمدم: هەر لە کاتی ئاساییدا هاتم› ۲. ڕەمەکی؛ بەبێ سەرتری و هەڤیازی ‹لباس معمولی؛ قیافەی معمولی: جلی ڕەمەکی؛ دەموچاوی ئاسایی› ۳. وەک خۆی؛ وەک بووە؛ لەسەر دەقی خۆی ‹همه چیز معمولی است: هەموو شتێک ئاساییە›.

**معنا** / ma'nā/: [عربی] ☜ **مَعنی**

**معناً** / ma'nan/: [عربی] *قید.* ۱. بە مانا؛ لە باری ماناوە ۲. لە باری مەعنەویەوە.

**معنادار** / ma'nādār/: [عربی/ فارسی] ☜ **معنی‌دار**

**معناشناسی** / ma'nāšenāsî/: [عربی/ فارسی] ☜ **معنی‌شناسی**

**معنایی** / ma'nāyî/: [عربی] *صفت.* مانایی؛ واتایی؛ گوزارەیی؛ هاوگەر یا سەر بە مانا ‹اختلاف معنایی: جیاوازی مانایی›.

**معنوی** / ma'navî/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ۱. مەعنەوی؛ سەر بە ئاوەز، بیر، هەست ‹فعالیت معنوی: چالاکی مەعنەوی› ۲. مەعنەوی؛ سەر بە هەرچی باری ماکی تێدا نەبێ ‹کمک معنوی: یارمەتی مەعنەوی› ۳. مانایی؛ واتایی؛ گوزارەیی؛ سەر بە مانای وشە.

**معنویات** / ma'navîyyāt/: [عربی]/اسم. ۱. سەرجەمی بەرهەمەکانی ئاوەز و بیر و هەست ۲. سەرجەمی ئەوانەی بایەخ و وەجی غەیرە ماکییان هەیە.

**معنویت** / ma'navîyyat ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. بەرهەمی بیر و ئەندێشە ۲. بەستراو بە بار و دۆخی غەیرە ماکیەوە.

**معنی** / ma'nî ، ـها/: [عربی]/اسم. مانا؛ مانێ؛ مەبەست: ۱. /معانی/ کار و ڕەوتی ڕوون کردنەوەی وشە یان سارستەیەک بە یارمەتی وشە و ڕستەگەلی زمانێک ‹این شعر را معنی کنید!: مانای ئەم شیعرە لێکدەنەوە!› ۲. ئەو چەمکە وا لە وشە یان زاراوەیێ تێدەگەین ‹معنی حقیقی؛ معنی اصطلاحی: مانای ڕاستەقینە؛ مانای زاراوەیی› ۳. نیاز؛ واز ‹معنی این کار چیست: نیاز لە ئەم کارە

چیە› ٤. مەبەستی گرینگ و بەتایبەت شاراوە لە شتێکدا ‹این حرفش خیلی معنی داشت: ئەم قسەیە زۆری مانا هەبوو› * معنا

▣ معنی اصطلاحی: مانای زاراوەیی؛ ئەو مانایە کە بۆ هەمووان یەکێک نیە (وەک «چنین» کە لای جووتیار مانایەکی هەیە و بۆ پیتچن مانایەکی‌تر).

معنی حقیقی: مانای ڕاستەقینە؛ واتای ڕاستەکی؛ مانایێ کە لە پلەی یەکەمدا بە بیر و ئاوەزدا دێ و سەر بە شتێکی ڕاستەکیە ‹معنی حقیقی نان همان مادەی خوراکی است: واتای ڕاستەکی نان هەر ئەو ماکە خۆراکیەیە›.

معنی مجازی: مانای خوازمانی؛ ئەو مانایە کە بێجگە لە مانای ڕاستەقینەی خۆی بە کار دێ ‹معنی مجازی نان غذا است و نە یک مادەی خوراکی معین: مانای خوازمانی نان بژیوە و نە ماکێکی خۆراکی تایبەت›.

بە معنی اخص: بە مانای تایبەت ‹آزادی بە معنی اخص عبارتست از...: ئازادی بە مانای تایبەت بریتیە لە...›.

▣ معنی کردن: مانا کردن/ کردنەوە؛ مانا لێدان/ لێدانەوە؛ واتا لێدان.

**معنی‌دار** / ma'nîdār/: [عربی/ فارسی] *صفت*. مانادار: ١. بە مانا ‹یک واژەی معنی‌دار بگویید: وشەیەکی مانادار بێژن› ٢. بە گرینگی یان چۆنیەتیەکی تایبەتەوە ‹خندەاش معنی‌دار بود و از خشم و حسد پنهانش حکایت می‌کرد: پێکەنینەکەی مانادار بوو، تووڕەیی و چاوچنۆکی شاراوەی دەردەبڕی› * معنادار

**معنی‌شناسی** / ma'nîšenāsî/: [عربی/ فارسی] *اسم*. *[زبان‌شناسی]* ماناناسی: ١. کار و ڕەوتی تۆژینەوەی مێژوویی و دەروونناسانە و ڕیزبەندی گۆڕانکاریگەل و گرینگی وشە وەک هۆکاری پەرە ساندن و پێشکەوتی زمانناسی ٢. سیمانتیک؛ لێکۆڵینەوە لەمەڕ پێوەندی نێوان نیشانە و دروشمی زمانگەلی سروشتی و داهێنراو لەگەڵ واتا و کارکردیاندا * معناشناسی

**معوج** / mo'vac/: [عربی] *صفت*. گێر؛ گێرپاگ؛ گێرپاو؛ لار؛ خوار و خێچ؛ خێچ، بەتایبەت بە پێچ و قەمچێ نارێکەوە.

**معوق** / mo'avvaq/: [عربی] *صفت*. دواکەوتوو؛ دواخراو.

▣ معوق گذاشتن: پاش خستن؛ خستنە دواوە؛ دواخستن.

معوق ماندن: دواخران؛ دواکەوتن؛ کەوتنە دواوە.

**معهذا** / ma'hāzā, ma:hāzā/: [عربی] ☜ مَعَذالک

**معهود** / ma'hûd/: [عربی] *صفت*. ١. دانراو؛ داندراو ٢. باو؛ بڕیاردراو.

**معیار** / me'yār, me:yār، ـها/: [عربی] *اسم*. سەنگ: ١. پێوەر؛ پێوماn؛ ئەوەی بۆ هەڵسەنگاندن و بەراوردی بایی یان لێهاتوویی شتێک لەگەڵ شتێکی‌تردا بە کار دەچێ ‹معیار خوبی و بدی؛ معیار درستی و نادرستی؛ معیار کوشش: پێوەری باشی و خراوی؛ سەنگی دروستی و نادروستی؛ پیومانی تێکۆشان› ٢. ئامێرێ بۆ هەڵسەنگاندنی پلەی بێخەوشی کانزا ٣. *[گفتاری]* سەرمەشق؛ نموونە.

**معیت** / ma'îyyat/: [عربی] *اسم*. هاوڕێیی؛ هاوڕایی؛ هاڤڕێیی؛ هەڤڕێکی؛ ئامڕایی.

▣ در معیت کسی: لەگەڵ کەسێک؛ لە خزمەت کەسێ؛ (لە) تەک کەسێ؛ لێل کەسێکا؛ چنی/ چەنی یۆی؛ وێڕای کەسێک ‹در معیت پدرم رفتیم و خرید کردیم: لەگەڵ بابم ڕۆشتین و شتمان کڕی›.

**معیشت** / ma'îšat/: [عربی] *اسم*. ١. ژیوار؛ ئەوی پێ دەژین ٢. ژیان.

**معیل** / mo'îl، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت*. خێزانبار؛ خێزاندار.

**معین** / mo'ayyan/: [عربی] *صفت.* دیاریکراو؛ شینبەر؛ دیارکری؛ دانراو؛ دەسنیشان‌کراو ‹در وقت معین حاضر شدیم؛ در جای معین قرار داده شد: لە کاتی دیارکراودا هاتین؛ لە شوێنی دەسنیشان‌کراودا دانرا›. هەروەها: **معین بودن؛ معین شدن؛ معین کردن**

**معین** / mo'în/: [عربی] *اسم.* ۱. *[ادبی]* یاریدەر؛ یاریدە؛ کۆمەک؛ هاریکار؛ یارمەتیدەر؛ یار؛ یاوەر؛ یاریکار؛ ئاریکار ۲. *[قدیمی]* بەردەست؛ دەسیار؛ دەستیار ۳. ☜ فعل معین، **فعل**

**معیوب** / ma'yûb، ـها/: [عربی] *صفت.* سەقەت؛ گۆسپە؛ عەیبدار؛ عەیبار؛ زەدە؛ زەدەدار؛ هاجرتی ‹یک چشمش معیوب است: چاوێکی سەقەتە›.

**مغ** / moq، ـها؛ ـان/: *اسم. [قدیمی]* موغ؛ ئەندامی گرۆیەکی دینی لە ئێرانی کەونارادا (تێبینی: لەمەڕ موغ و چۆناوچۆنی پێوەندی لەگەڵ دینی زەردەشتدا قسە و باس زۆرە و یەک ناگرنەوە).

**مغار** / maqār، ـها/: *اسم. [نجاری]* ئەسکەنە؛ مغار؛ موغار؛ تیخی نەجاران؛ ئامرازێکی دارکۆلینی دارتاشانە.

**مغازلات** / moqāzelāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مغازله**

**مغازله** / moqāzele، ـها؛ مغازلات/: [عربی] *اسم.* ۱. قسەوباسی ئەویندارانە ۲. ئەوینبازی؛ عەشقبازی.

**مغازه** / maqāze، ـها/: [از فرانسوی: magasin/ از عربی، مَخزَن] *اسم.* دووکان؛ دوکان؛ تکان؛ کۆگا؛ مەغازە؛ فرۆشگا؛ جێگەی فرۆشتن ‹مغازەی کفش‌فروشی: دووکانی کەوش‌فرۆشی›.

**مغاک** / moqāk، ـها/: *[ادبی]* ☜ **گودال**

**مغالطه** / moqālete, moqālate، ـها/: [عربی] *اسم.* کاری هەڵەویژی/ هەڵەوەڕی کردن.

**مغایر** / moqāyer/: [عربی] *صفت.* ۱. جیاواز؛ جیاکار ‹این مغایر با چیزی است که قبلا نشان داده‌اید: ئەمە لەو شتەی لە پێشدا نیشانتان داوە جیاوازە› ۲. ناسازگار ‹اقدامات مغایر حسن همجواری: کارگەلی ناسازگار لەگەڵ جیرانداری›.

**مغایرت** / moqāyerat، ـها/: [عربی] *اسم.* ۱. جیاوازی؛ جیاکاری ۲. ناسازگاری؛ ناتەبایی.

**مغبون** / maqbûn/: [عربی] *صفت.* دەسخەڕۆ؛ خڵەتاو؛ خەڵەتیا؛ غەڵەتیا؛ خڵەتیاگ؛ فریودراو؛ هەڵخڵەتاو، بەتایبەت لە دان‌وستاندا ‹فکر نمی‌کردم دوستم بخواهد مرا مغبون کند: پێم وانەبوو دۆستەکەم بیەوێ دەسخەڕۆم بکا›.

**مغبونی** / maqbûnî/: [عربی] *اسم.* هەڵخڵەتاوی؛ دەسخەڕۆیی؛ فریودراوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی خڵەتیان ‹آن‌قدر از مغبونی دلم نمی‌سوزد که از خیانت رفیق: هێندە لە هەڵخڵەتاوی جەرگم ناسووتێ وەک لە خەیانەتی دۆست›.

**مغتنم** / maqtanam/: [عربی] *صفت.* ۱. دەرفەت؛ دەسکەوت؛ هەڵکەوت؛ هەڵکەفت؛ دەلیڤە؛ شیاوی بەهرەمەند بوون و کەڵک گرتن ‹فرصت را مغتنم شمردم و طلبم را از او گرفتم: هەلم بە دەرفەت زانی و قەرزەکەم لێ‌ساندەوە› ۲. بایەخدار؛ هێژا ‹دیدار شما مغتنم بود: دیدارتان بایەخدار بوو›. هەروەها: **مغتنم دانستن؛ مغتنم شمردن**

**مغذی** / moqazzî/: [عربی] *صفت.* ۱. بژیەنی؛ ژیەنی؛ بە بایەخی بژیویەوە ‹سیب‌زمینی بسیار مغذی است: سێفەزەوینی زۆر بژیەنییە› ۲. بژیەن؛ خۆراکدەر ‹عروق مغذی قلب: دەماری بژیەنی دڵ›.

**مغرب** / maqreb/: [عربی] *اسم.* ڕۆژئاوا؛ ڕۆژاوا؛ ڕۆژاڤا؛ هۆراوا؛ خۆراوا؛ خۆرنشین: ۱. لایێ کە خۆری لێ ئاوا دەبێ ‹خورشید در سمت مغرب بود: خۆر لە ڕۆژاوادا بوو› ۲. ولاتی خۆرنشین ۳. شێوان؛ زەردەپەڕ؛ دەمی خۆرنیشتن ‹اذان مغرب: بانگی شێوان›.

**مغرب زمین** / maqrebzamîn/: [عربی/ فارسی] *اسم. [مجازی]* ڕۆژاوا؛ ولاتی ڕۆژاوا؛ ولاتی خۆرنشین؛ ئوورووپا و ئەمریکا.

۱. هۆزی زەردپێستی موغولستان لە ئاسیای ناوەندی ۲. ـها؛ ـان/ هەر کام لە کەسانی ئەو هۆزە.

**مغـولی** / moqolî/: اسم. موغـولی؛ تاقمـێ لـە زمانەکانی ئاسیای ناوەندی کە سـەر بـە هـۆزی موغول و خزمەکانیە.

**مف** / mof/: اسم. [گفتاری] چڵـم؛ کڵـم؛ چـرم؛ کڵمیش؛ چۆڵم؛ ڤیچک؛ ئاوی خەستی کەپۆ.

**مفاتیح** / mafātîh/: [عربی] جمعِ ☜ **مفتاح**

**مفاخر** / mafāxer/: [عربی]/اسم. مایەی شانازی.

**مفاد** / mafād(d)/: [عربی]/اسم. کاکڵە؛ نـاوەڕۆک؛ ئەوەی کە لە قسە یان نووسراوەیێ فام دەکـرێ ‹مفاد سخنش این بود که باید برای جوانان کـاری کـرد: کاکڵەی قسەکەی ئەوە بوو کە دەبێ بۆ لاوان کـارێ بکرێ›.

**مفاسد** / mafāsed/: [عربی] جمعِ ☜ **مَفسَده**

**مفاصاحســـاب** / mofāsāhesāb/: [عربـی]/اسـم. ۱. کـاری پـاک لـە پـاک کـردنی حسـاب و دان‌وستانی قەرز و خواز ۲. ـها/ بەڵـگەی سـەر پاک لە پاک بوونی حیساب.

**مفاصل** / mafāsel/: [عربی] جمعِ ☜ **مَفصَل**

**مفاعلن** / mafā'elon/: [عربی]/اسم. مەفاعیلون؛ لە پایەکانی کێشی شێعری عەرووزی.

**مفاعیلن** / mafā'îlon/: [عربی]/اسـم. مـەفاعیلون؛ لە پایەکانی کێشی شێعری عەرووزی.

**مفاهیم** / mafāhîm/: [عربی] جمعِ ☜ **مَفهوم**

**مفت**[1] / moft/: صفت. خـۆڕایی؛ بـەلاش؛ مشـە؛ فیڕۆ؛ ئاوانتە؛ هەوانتە؛ هەڵەمتە؛ هرت؛ وەلیفەت؛ بێ‌نرخ؛ کوبەڵ؛ خـۆڕا؛ هـەروا؛ بـهـەروە؛ مفـت؛ مفتە؛ مفتەکی؛ مفتی؛ مفتێ: ۱. بەبێ نرخ ‹اگـر مفت است به من هم بـده!؛ مفـت باشـد، کوفـت باشـد!: ئەگەر خۆڕاییە بدە بـە منـیش!؛ مفـت بـێ و کـفـت بێ!› ۲. [مجازی] زۆر هەرزان ‹هزار تومان مفت است، دو برابر ایـن مـی‌ارزد: هـەزار تمـەن مفتـە، دوو ئەوندە دەژی›.

⊡ **مفت چنگ کسی**: [تعریض] هەر بۆ کەسێ؛ لـە کەسێ موبارەک ‹اگر دعوا بر سر خانه است، مفت چنگ تو، نه خانه را می‌خواهم و نه هـیچ چیـز دیگـر: ئەگەر شەڕ لە سەر ماڵە، هەر بۆ تۆ، نە ماڵم دەوێ و نە هیچی‌تر›.

⊡ **مفت گران بودن**: [کنایی] دزنەبەر بوون؛ مفت گران بوون؛ بێ‌نرخ بـوون؛ مفـت نـەژیان: بـە **مفت نیرزیدن**

**به مفت نیرزیدن** ☜ **مفت گران بودن**

**مفت**[2]: قید. [گفتاری] مفتە؛ مفت؛ هەوانتە؛ ئاوانتە؛ بهەروە: ۱. بەخۆڕایی؛ بە مفتە؛ بەبـەلاش؛ بـە بێ نرخ ‹مفت به چنگ آوردم؛ زندگی را مفـت بـاختیم: بەخۆڕایی کەوتە چنگم؛ ژیانمان بەبـەلاش دۆڕانـد› ۲. زۆر هەرزان ‹مفت خریدی، بیش از این‌ها مـی‌ارزد: مفت کڕیوتە، زورتر ئەژێ›.

**مفتــاح** / meftāh، مفـاتیح/: [عربـی]/اسـم. [ادبـی] کلیل؛ کلێل.

**مفتخــر** / moftaxar/: [عربـی] صفت. سـەربەرز؛ سەرفەراز؛ سەربڵـند ‹با حضور خـود مـا را مفتخـر فرمایید: بە هاتنتان سەربەرزمان کەن›.

**مفتخــــراً** / moftaxaran/: [عربـــی] قیـــد. بــــە ســــەربەرزیەوە؛ بــــە ســــەرفەرازیەوە؛ بــــە سەربڵـندیەوە؛ بـە شـانازیەوە ‹مفتخـراً بـە عـرض می‌رساند: بە شانازیەوە عەرز دەکەین›.

**مفتخــور** / moftxor، ـهـا؛ ـان/: اسم. مفتـەخۆر؛ مفتخـــۆر؛ بەلاشـــخۆر؛ لامـــژ؛ ئاوانتـــەچی؛ هەڵەمتەچی؛ مفتەوەر؛ ئەو کەسەی هەوڵ نادا و بە ڕەنجی خەڵک دەژی. هەروەها: **مفتخوری**

**مفتــری** / moftarî، ـهـا؛ ـان/: [عربـی]/اسـم. بوختانکەر؛ درۆهەڵبەست؛ دەلەسەساز؛ کەسـێ کە بۆ خەڵکی بوختان ساز ئەکا.

**مفـتش** / mofatteš، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. [قدیمی] ۱. پشکن؛ پشکێن؛ ماڵ‌پشکن؛ پشکنەر؛ پشکنیار؛ کەسێ کە ئەرکداری پێڕاگەیشـتن بـە چۆنیـەتی ڕووداو یـان کارێکـە ۲. پولیسـی

**مغربـی / maqrebî** ، ـهـا؛ ـان/: [عربـی] *صـفت*. ۱. ڕۆژاوایی؛ هـۆراوایی؛ لای ڕۆژاوا ۲. سـەر بـە ولاتی مەراکێش لە ڕۆژاوای ئەفریقا.

**مغرض / moqrez** ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی] *صفت*. قینەبـەر؛ ڕقەبـەر؛ غـەرەزن؛ ڕکـین؛ ڕکـوونی؛ ڕککوو؛ ڕقجوین؛ ڕقلەسک؛ دەبنەوەبڕ؛ قین لە دڵ ‹به حرف آدمهای مغرض گـوش نـده!: گـوێ لـە قسەی مرۆی قینەبەر مەگرە!›.

**مغرضانه[1] / moqrezāne** /: [عربـی/ فارسـی] *صـفت*. ڕقەبەرانە؛ قینەبەرانە؛ ڕکینانە؛ قیناوی؛ ژەهراوی ‹قضاوت مغرضانه: دادوەری ڕقەبەرانە›.

**مغرضـانه[2]**: *قیـد*. قینەبەرانـە؛ ڕقەبەرانـە؛ بـە ڕقلەسکی؛ بە ڕککوونی؛ بە ڕککـینی؛ ڕکینانـە؛ ڕقلەسـکانە ‹مغرضـانه قضـاوت مکـن!: قینەبەرانـە داوەری مەکە!›.

**مغرور / maqrûr** ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت*. خۆبین؛ غللوور؛ خۆبایی: ۱. لە خۆ بـایی؛ لـەخۆدەرچوو؛ بە فیز و هوا؛ باغر؛ قاپـان؛ قۆڕەدەمـاخ؛ جلقـوز؛ فیزن؛ بەفیز؛ بایی‌هـەوا؛ بـرووت؛ کرانـە؛ بغـوور؛ دەفرە؛ خەرۆ؛ قولم؛ ترزل؛ خۆ بـەزل‌زان ‹خیلـی مغـرور اسـت کمـک قبـول نمـی‌کنـد: زۆر لەخوباییـە یارمـەتی کەسـی نـاوێ› ۲. بـە پشـتگەرمی و ڕاپەرمیان بە شـتێکی ڕاسـتەکی یـان خەیالـی ‹خیلی به ثروتش مغرور شده اسـت: تـەواو بـە مـاڵ و سامانی غللوور بووە›.

**مغروری / maqrûrî** /: [عربـی]/*سـم*. ۱. خـۆبینی؛ قاپانی؛ قولمی؛ غللوری؛ قۆڕەدەمـاخی؛ بـاغری؛ لەخۆدەرچوویی؛ بغووری؛ ترزلی؛ خۆبەزل‌زانی.

**مغـروق / maqrûq** ، ـان؛ ـین/: [عربـی] *صـفت*. ۱. خنکاو؛ خنکیاگ؛ تاساو؛ تاسـیا ‹جنـازەی فـرد مغروق از آب گرفته شد: لاشەی خنکاوەکە لە ئاوگیرا› ۲. *[کنـایی]* تایبەتمەنـدی کەسـێ کـە زۆر ئەپەرژێتە سەر کارێک و ئاگای لە دنیا براوە.

**مغـز / maqz** /: *اسـم*. مێشـک؛ مـژگ؛ مـەژگ؛ مەژک؛ مژی؛ مێژی؛ مەژی؛ مەژو؛ مەژۆ؛ مەزگ؛ مێژەلاک؛ مەغز: ۱. بەشێ لە کۆندامی دەمـاری ناوەنـدی مـۆرەداران کـە کـاپۆڵ دایگرتـووە ۲. *[گیاەشناسـی]* بەشـی ناوەنـدی یـا نـاوەوەی لاسکی گیـای دوولـەتکی ۳. *[گفتـاری]* گۆشـتی میوە کە لە ژێر پێستەکەیدایە ٤. لـها/ *[مجازی]* هەلکەوتە؛ هەلـکەوتوو ‹فـرار مغزهـا: دەرچـوونی هەلکەوتە› ٥. لـها/ نـاوە؛ بەشـی ناوەنـدی یـان سەرەکی شتێ ‹مغز اسـتخوان؛ مغـز مـداد: مـەژگی ئێسک؛ ناوەی میـداد› ٦. کاکلـە؛ کـاکڵ؛ پێشـە؛ بەشـی ناوەنـدی یـا نـاوەوەی بـەری گیـای دوولەتکی ۷. چێشتێک لە مێشکی مەڕ یان گـا ۸. ناو؛ ناوەند؛ نێوان ۹. بیر؛ هزر ‹مغزت را به کـار بینداز!: مێشکت وەکار خە!›.

◙ **مغـز اسـتخوان**: ۱. گیانەمـەژگ؛ مێـژوک؛ مەژگی ئێسک؛ بەشی نەرم و ناوەکی ئێسـکی درێژ کـە بـڕێکیان کـاران و خـوێن دروسـت دەکەن و ئەوانی‌تریش لە چـەوری ئـاخنراون ۲. گیان؛ ناخ ‹سرما تا مغز استخوانم رفته: سـەرما چووەتە گیانم›.

**مغز بادام**: ناوکە بادام؛ کاکلە بادام. هـەروەها: **مغز پسته**

**مغز تیره**: مۆخ؛ موخ؛ مێشکە ڕەش.

**مغز حرام**: موخ؛ مۆخ.

**مغز دانه**: *[گیاەشناسی]* مێشکی دەنک؛ ناوەڕۆکی دانە.

**مغـز گـردو**: کاکلـە؛ مەژگـە؛ کاکلـەقووچە؛ قەلاقووچکە؛ قەلاقووچە؛ ناوکی گوێز.

**مغز مداد**: مێشکی میداد؛ تێکەلاوی گرافیت و گلـەدێزە کـە بـە گـوێرەی ڕێـژەی تێکـەل بوونیان نەرم و ڕەق دەبێ.

**مغز میانی**: مێشکی ناوەنـدی؛ بەشـی نـاوەکی مێشک لـە تـۆلی مۆرەدارانـدا کـە لـە کـاتی گووران دیوارەکەی پتەو دەبێتەوە.

◘ **مغـز خـر خـوردن**: *[کنـایی]* مێشـکی کـەر خـواردن؛ گێـل و حـۆل بـوون ‹مگر مغز خر

خوردەام که بخواهم چنین کاری بکنم؟!: مەگین میشکی کەرم خواردووە بمەوێ کاری وا بکەم؟!›.

مغز خود را به کار انداختن: بیر/ مێشکی خۆ خستنە کار؛ ورد و ژیرانە بیرکردنەوە ‹مغزت را به کار بینداز! ببین می‌خواهی چه بکنی: مێشکت بخە کار! بزانە ئەتەوێ چی بکەی›.

**مغزپخت** / maqzpoxt/: صفت. ناوبرژاو؛ ناوپیشاو؛ ناوپیشیاگ؛ باش‌کوڵاو.

**مغزپسته‌ای**[1] / maqzepeste'î/: اسم. پستەیی؛ ڕەنگی سەوزی کاڵی ئاماڵ زەرد.

**مغزپسته‌ای**[2]: صفت. پستەیی؛ بە ڕەنگی سەوزی ئاماڵ زەرد.

**مغزشویی** / maqzšûyî/: اسم. [مجازی] شستشوی مغزی ☜ **شستشو**

**مغزی**[1] / maqzî/: اسم. مەغزی: ١. مێشک ‹مغزی مداد: مێشکی میداد› ٢. نەوارێکی باریک لە چەرم یان پارچە کە بۆ جوانی دەخرێتە نێوان دو لێوارەی جلک یان کەوشەوە ٣. تیکە لوولەی دوو سەر ڕزن کراو لە لوولەکێشیدا ٤. قفڵی ناوکار.

**مغزی**[2]: صفت. مێشکی؛ مەژگی؛ هاوگەر یان پێوەندیدار بە ناو کاپۆڵ و مێشکەوە ‹ورم مغزی: هەوی مێشکی›.

**مغشوش** / maqšûš/: [عربی] صفت. شێواو؛ ئاڵۆز؛ پەشێو؛ تێکچوو؛ شڵەژاو: ١. پەشۆکاو؛ پەشۆکیا؛ چەواشە؛ ژەلمسە؛ ژولسە؛ منتەوەش؛ گژۆڵە؛ بێ سەرەوبەرە ‹وضع مغشوش است؛ مدتی نبودم کارها مغشوش شده است: بار و دۆخ ئاڵۆزە؛ ماوەیێ نەبووم کارەکان تێکچووە› ٢. پەرێشان؛ شپرز؛ تێک‌هەڵچوو؛ ژوولیاگ ‹خیلی مغشوش به نظر می‌رسید: زۆر پەرێشان ئەهاتە بەر چاو›.

**مغضوب** / maqzûb ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. بەرڕق؛ بەرغەرەز؛ غەزەب لێگیراو ‹مغضوب شد و کارش را از دست داد: بەرڕق کەوت و کارەکەی لە دەس چوو›.

**مغفرت** / maqferat/: [عربی] اسم. [ادبی] نوخاف؛ لێخۆش بوویی؛ لێبووری؛ بەخشایشت.

**مغفور** / maqfûr/: [عربی] صفت. [ادبی] بەخشراو؛ لێبوردوو؛ لێخۆشبوو؛ عافووکراو؛ نوخافتی.

**مغلطه** / maqlate ، ـها/: [عربی] اسم. هەڵەوێژی؛ هەڵەوەڕی؛ قسەی بە ڕواڵەت دروست و لە ناوەڕۆکدا هەڵە.

▣ **مغلطه کردن**: هەڵەوێژی کردن؛ هەڵەوەڕی کردن؛ بە قسەی لێڵ و بە ڕواڵەت دروست خەڵکی بە هەڵەدا خستن.

**مغلق** / moqlaq/: [عربی] صفت. ڕەق؛ دژوار؛ بە زمانێ کە لێ تێگەیشتنی دژوارە ‹خیلی مغلق حرف می‌زد، چیزی از حرف‌هایش نفهمیدم: زۆر ڕەق قسەی دەکرد هیچی لێ تێنەگەیشتم›.

**مغلوب** / maqlûb/: [عربی] صفت. بەزیو: ١. ـها؛ ـان؛ ـین/ بەزیا؛ بەزیاگ؛ شکست خواردوو ٢. [زیست‌شناسی] بەبێ کاریگەری و توانستی ئاشکرا بوون ‹ژن مغلوب: ژێنی بەزیو›.

▣ **مغلوب شدن**: دۆڕاندن؛ بەزین؛ بەزان؛ بەزیەی؛ بەزیای ‹دشمن در جنگ مغلوب شد: دژمەن لە شەڕدا دۆڕاندی›.

**مغلوب کردن**: بەزاندن؛ بەزنەی؛ بەزنای؛ شکست پێدان.

**مغلوط** / maqlût/: [عربی] صفت. هەڵە؛ نادروست ‹این نامه که سر تا پا مغلوط است!: ئەم نامەیە خۆ سەر لە بەر هەڵەیە!›.

**مغموم** / maqmûm/: [عربی] صفت. [ادبی] خەمبار؛ گرتە؛ خەمین؛ خەمناک؛ مرووز؛ مرووچ؛ دڵ‌پەشێو؛ پەژارەمەند؛ خەفەتبار؛ داگیراو؛ پەشێو.

**مغناطیس** / meqnātîs/: [معرب از یونانی] اسم. ئاسن‌ڕفێن؛ ئاسنکێش؛ مەگنەتیک؛ میغناتیس.

**مغناطیسی** / meqnātîsî/: [معرب] صفت. میغناتیسی؛ مەگنەتیکی.

**مغول** / moqol, moqul/: اسم. موغول؛ مەغول:

۱. هۆزی زەردپێستی موغولستان لە ئاسیای ناوەندی ۲. ـها؛ ـان/ هەر کام لە کەسانی ئەو هۆزە.

**مغـولی** / moqolî/: *اسم.* موغـولی؛ تاقمـێ لـە زمانەکانی ئاسیای ناوەندی کە سـەر بـە هـۆزی موغول و خزمەکانیە.

**مف** / mof/: *اسم. [گفتاری]* چلـم؛ کلـم؛ چـرم؛ کلمیش؛ چۆلم؛ ڤیچک؛ ئاوی خەستی کەپۆ.

**مفاتیح** / mafātîh/: [عربی] جمعِ ☜ **مفتاح**

**مفاخر** / mafāxer/: [عربی]/اسم. مایەی شانازی.

**مفاد** / mafād(d)/: [عربی]/اسم. کاکڵە؛ نـاوەڕۆک؛ ئەوەی کە لە قسە یان نووسراوەیێ فام دەکـرێ ‹مفاد سخنش این بود که باید برای جوانان کـاری کـرد: کاکڵەی قسەکەی ئەوە بوو کە دەبێ بۆ لاوان کـارێ بکرێ›.

**مفاسد** / mafāsed/: [عربی] جمعِ ☜ **مَفسَدە**

**مفاصاحســـاب** / mofāsāhesāb/: [عربـی]/اسـم. ۱. کـاری پـاک لـە پـاک کـردنی حسـاب و دانوستانی قەرز و خواز ۲. ـها/ بەڵـگەی سـەر پاک لە پاک بوونی حیساب.

**مفاصل** / mafāsel/: [عربی] جمعِ ☜ **مَفصَل**

**مفاعلن** / mafā'elon/: [عربی]/اسم. مەفاعیلون؛ لە پایەکانی کێشی شێعری عەرووزی.

**مفاعیلن** / mafā'îlon/: [عربی]/اسـم. مـەفاعیلون؛ لە پایەکانی کێشی شێعری عەرووزی.

**مفاهیم** / mafāhîm/: [عربی] جمعِ ☜ **مَفهوم**

**مفت**[1] / moft/: *صفت.* خـۆڕایی؛ بـەلاش؛ مشـە؛ فێڕۆ؛ ئاوانتە؛ هەوانتە؛ هەلەمتە؛ هرت؛ وەلیفەت؛ بێنرخ؛ کوبەڵ؛ خـۆڕا؛ هـەروا؛ بـهـەروە؛ مفـت؛ مفته؛ مفتەکی؛ مفتی؛ مفتێ: ۱. بەبێ نرخ ‹اگـر مفت است به من هم بـده!؛ مفت باشد، کوفت باشـد!: ئەگەر خۆڕاییە بدە بـە منـیش!؛ مفـت بـێ و کفـت بێ!› ۲. *[مجازی]* زۆر هەرزان ‹هزار تومان مفت است، دو برابر این مـی‌ارزد: هـەزار تمـەن مفتـە، دوو ئەوندە دەژێ›.

◙ **مفت چنگ کسی:** *[تعریض]* هەر بۆ کەسێ؛ لـە کەسێ موبارەک ‹اگر دعوا بر سر خانه است، مفـت چنگ تو، نه خانه را می‌خواهم و نه هـیچ چیـز دیگـر: ئەگەر شەڕ لە سەر ماڵە، هەر بۆ تۆ، نە ماڵم دەوێ و نە هیچیتر›.

◙ **مفت گران بودن:** *[کنایی]* دزنەبەر بوون؛ مفت گران بوون؛ بێنرخ بـوون؛ مفـت نـەژیان: بـه **مفت نیرزیدن**

**به مفت نیرزیدن** ☜ **مفت گران بودن**

**مفت**[2]: *قید. [گفتاری]* مفته؛ مفت؛ هەوانتە؛ ئاوانتە؛ بـهەروە: ۱. بەخۆڕایی؛ بە مفتە؛ بەبـەلاش؛ بـە بێ نرخ ‹مفت به چنگ آوردم؛ زندگی را مفـت بـاختیم: بەخۆرایی کەوتە چنگم؛ ژیانمان بەبـەلاش دۆڕانـد› ۲. زۆر هەرزان ‹مفت خریدی، بیش از این‌ها مـی‌ارزد: مفت کڕیوتە، زورتر ئەژێ›.

**مفتــاح** / meftāh، مفـاتیح/: [عربـی]/اسـم. *[ادبـی]* کلیل؛ کلێل.

**مفتخــر** / moftaxar/: [عربـی] *صـفت.* سـەربەرز؛ سەرفەراز؛ سەربڵـند ‹با حضـور خـود مـا را مفتخـر فرمایید: بە هاتنتان سەربەرزمان کەن›.

**مفتخـــراً** / moftaxaran/: [عربـی]/قیـد. بــە ســـەربەرزیەوە؛ بـــە ســـەرفەرازیەوە؛ بـــە سەربڵـندیەوە؛ بـە شـانازیەوە ‹مفتخـراً بـه عـرض می‌رساند: بە شانازیەوە عەرز دەکەین›.

**مفتخـور** / moftxor، ـها؛ ـان/: *اسم.* مفتـەخۆر؛ مفتخـــۆر؛ بەلاشـــخۆر؛ لامـــژ؛ ئاوانتـــەچی؛ هەلەمتەچی؛ مفتەوەر؛ ئەو کەسەی هەوڵ نادا و بە ڕەنجی خەڵک دەژی. هەروەها: **مفتخوری**

**مفتــری** / moftarî، ـهـا؛ ـان/: [عربـی]/اسـم. بوختانکەر؛ درۆهەڵبەست؛ دەلەسەساز؛ کەسـێ کە بۆ خەڵکی بوختان ساز ئەکا.

**مفـتش** / mofatteš، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* ۱. پشکن؛ پشکێن؛ ماڵپشکن؛ پشکنەر؛ پشکنیار؛ کەسێ کە ئەرکداری پێڕاگەیشـتن بـە چۆنیـەتی ڕووداو یـان کارێکـە ۲. پولیسـێ

پەنامەکی.

**مفتضح** / moftazah, moftazeh/: [عربی] *صفت.* ١. ترۆ؛ هەتک؛ سووک؛ بەدناو؛ بێئاوروو ‹روزنامەها او را مفتضح کردند: ڕۆژنامەکان ترۆیان کرد› ٢. نالەبار؛ ناحەز؛ پرشوورەیی ‹رفتار مفتضح: ئاکاری نالەبار›. هەروەها: **مفتضح شدن؛ مفتضح کردن**

**مفتعلن** / mofta'elon/: [عربی] *اسم.* موفتەعیلون؛ لە پایەکانی کێشی شیعری عەرووزی.

**مفتکی** / moftakî/: *قید. [گفتاری]* (بە) خۆڕایی؛ مفتەکی؛ (بە) مفتە؛ (بە) بەلاش؛ (بە) ئاوانتە ‹مفتکی دادند؛ مفتکی سوار شدند: بە خۆڕایی دایان؛ مفتەکی سوار بوون›.

**مفتن** / mofatten/: [عربی] *صفت.* ئاژاوەگێڕ؛ ئاژاوەچی؛ گۆبەندگێڕ؛ گۆتالکار؛ خەمشێوێن؛ شەڕهەڵخڕێن؛ پیلانگێڕ؛ کەتنگێڕ؛ فتنە؛ هێوچی؛ گولکە؛ شێوەژنە؛ بشێونە؛ گێرەشێوێن؛ ئاشۆکەر؛ تێکدەر؛ خومەشێنکە؛ خومشێوێن؛ خومەشێونە؛ ئاشۆوەکەر؛ سۆدرە؛ سەرسۆدەرە؛ شەڕهەڵایسێن ‹برخی همسایەهای مفتن هم بە آتش اختلاف دامن می‌زدند: هێندێ لە هاوسایانی ئاژاوەگێڕیش ئاوری شەڕەکەیان خۆشتر دەکرد›.

**مفتوح** / maftûh/: [عربی] *اسم.* ١. *[نامتداول]* کراوە؛ باز؛ واز؛ وا؛ ئاواڵە؛ ئاوەلا؛ وەکری؛ ڤەکری ‹از ٨ صبح مفتوح است: لە ٨ ی بەیانیەوە بازە› ٢. سەرەدار؛ بە نیشانەی سەرەوە. (وەک لە وشەی «بَهار» دا، پیتی «ب» سەرەدارە. ئەم نیشانە لە ڕێنووسی کوردیدا بۆتە «ە»).

**مفتول** / maftûl، ـها/: [عربی] *اسم.* تەل؛ تێل؛ سیم؛ هەودای باریکی کانزایی بە کۆتەری کەمتر لە ٥ میلی‌میتر.

**مفتولپذیری** / maftûlpazîrî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* تایبەتمەندی بڕێ کانزا کە بێ‌پسان شکڵ دەگۆڕن و دەبنە تەل.

**مفت و مسلم** / moft-o-mosallam/: [فارسی/ عربی] *قید.* مفت و مەرحەبا؛ لە خۆڕا؛ بە خۆڕایی؛ لە خوت و خۆڕایی.

**مفتون** / maftûn/: [عربی] *صفت.* شەیدا؛ دێوانە؛ دین؛ لێوە؛ شێت؛ شێت و شەیدا؛ عەوداڵ.

**مفتی**[1] / moftî، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* موفتی: ١. فتوادەر؛ ئەو کەسەی هێژای فتوا دانە ٢. مامۆستای پلەبەرزی سوننی.

**مفتی**[2]: *صفت. [گفتاری]* مفتە؛ مفتەیی؛ بەلاش؛ ئاوانتە؛ خۆڕایی ‹غذای مفتی: خۆراکی مفتە›.

**مفتی**[3]: *قید. [گفتاری]* بە خۆڕایی؛ مفتە؛ بە مفت؛ مفتەکی؛ بە بەلاش؛ بەمفتە ‹کسی مفتی کار نمی‌کند: کەس بە خۆڕایی کار ناکا›.

◘ **مفتی‌مفتی**: *[گفتاری]* مفت و مەرحەبا؛ بەبێ‌کار و تێکۆشان ‹مفتی‌مفتی کە آدم بە این‌جا نمی‌رسد: مفت و مەرحەبا کەس بە شت نابێ›.

**بە این مفتی(ها)**: هەروا سووک و هاسان ‹دانشگاە رفتن کە بە این مفتی‌ها نیست: چوونە زانستگا هەروا سووک و هاسان نیە›.

**مفر** / mafar(r)، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* دەرەتان؛ ویستە؛ دەرو؛ بوار؛ سەرەدەر؛ ڕێگەی دەرچوون ‹دنبال مفر می‌گشت: لە شوێن دەرەتانێک دەگەڕا›.

**مفرح** / mofarrah/: [عربی] *صفت. [ادبی]* شادیهێنەر؛ شادیهێن؛ دڵگەشێن.

**مفرد** / mofrad/: [عربی] *صفت.* ١. تەک؛ تەنها؛ تاک؛ تاق ٢. جیا؛ جوێ؛ جگا ٣. تاکە بەیت.

**مفردات** / mofradāt/: [عربی] *اسم.* تاکەگەل؛ کۆمەڵە شتی تاک و سەڵت کە ئەندامانی دەگەڵ هیچ شتێکی‌تردا کۆ نەبوونەتەوە یان تێکەڵی هەڵناگرن.

**مفرش** / mafraš، ـها/: [عربی] *اسم.* مەوج؛ مۆج؛ مەوجە؛ ئەو قوماشە جێوانی تێ دەپێچن.

**مفرط** / mofrat/: [عربی] *صفت. [ادبی]* یەکجار زۆر؛ زۆر و زەبەند؛ فرەفرە ‹تلاش مفرط: هەوڵی یەکجار زۆر›.

**مفرغ** / mefraq/: [از عربی] *اسم.* هەمەندوش؛

حەوجۆش؛ مەفرەق؛ برونز؛ ئالیاژێکە لە مس و قەلا بە ڕەنگی قاوەیی کاڵ کە پەیکەر و کەرستەی جۆراوجۆری لێ دروست دەکەن.

**مفرغی** / mefraqî/: [از عربی] *صفت*. مەفرەقی: ۱. هەمەندوشی؛ بە ڕەنگی قاوەیی تۆخ ۲. برونزی؛ لە جنسی مەفرەق.

**مفروز** / mafrûz/: [عربی] *صفت*. بەشکراو؛ بەش‌کریاگ.

**مفروش** / mafrûš/: [عربی] *صفت*. فەرشکراو ‹اتاقی مفروش در انتهای حیاط خانه دیده می‌شد: دیوێکی فەرشکراو لە ئاخری حەوشەکەوە دەبینرا›. هەروەها: **مفروش بودن؛ مفروش شدن؛ مفروش کردن**

**مفروض** / mafrûz ، ـات/: [عربی] *صفت*. فەرزکراو؛ وادانراو؛ واگیراو.

**مفروق** / mafrûq/: [عربی] ☜ **کاسته**

**مفروق منه** / mafrûqo(n)menh/: [عربی] ☜ **کاهشیاب**

**مفسد** / mofsed ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. گەندەڵکار؛ خراپەکار؛ خراوکار.

**مفسده** / mafsade ، ـها؛ مفاسِد/: [عربی]/*اسم*. فناز؛ فناس؛ فیناز؛ بشێوە؛ کارێ کە دەبێتە هۆی ئاژاوە، بشێوی یان ئازاری خەڵک.

**مفسده‌جویی** / mafsadecûyî ، ـها/: [عربی/فارسی]/*اسم*. ئاژاوەگێڕی؛ بشێوەخوازی. هەروەها: **مفسده‌جو**

**مفسر**[1] / mofasser ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/*اسم*. ڕاڤەکار؛ ڕاڤەوان؛ ڕاڤەکەر؛ ڕاژەکار: ۱. کەسێ واتای وتە و نووسراوە لێک دەداتەوە ‹مفسر قرآن: ڕاڤەوانی قورئان› ۲. شرۆڤەکار؛ کەسێ لە سەر هۆ، ئەنگیزە و ئاکامی ڕووداوان بڕوا و لێکیان داتەوە ‹مفسر سیاسی: ڕاڤەکاری ڕامیاری›.

**مفسر**[2]: *صفت*. ڕاڤەکار؛ ڕاژەکار؛ تایبەتمەندی شتێک کە شتێکی‌تر لێک بداتەوە ‹برخی آیات مفسر آیات دیگرند: بڕێ لە ئایەتەکان ڕاڤەکاری ئایەتەکانی‌ترن›.

**مفصل** / mafsal ، ـها/: [عربی]/*اسم*. جەمگە؛ جومگە؛ جونگە؛ گە؛ خڕکە؛ بەند؛ مۆڤک؛ ماچلەک (بە شێوەی کۆ): ۱. /مفاصل/ جەمسەری دوو ئێسکی بە یەک گەیشتوو ۲. لەتەیەکی نێو دەزگا کە لەتەکانی‌تر دەخاتە جووڵە.

**مفصل** / mofassal/: [عربی] *صفت*. چڕ و پڕ؛ تێر و تەسەل؛ تێر و پڕ؛ دوور و درێژ ‹شرح مفصل؛ کتک مفصل: ڕاڤەی چڕ و پڕ؛ لێدانی تێر و تەسەل›.

**مفصلاً** / mofassalan/: [عربی] *قید*. بە تێر و تەسەلی؛ تێر و پڕ؛ بە وردەکاریەوە؛ ورد- ورد؛ بە چڕ و پڕی ‹نشستیم و مفصلاً صحبت کردیم: دانیشتین و بە تێر و تەسەلی قسەمان کرد›.

**مفطر** / mofter ، ـات/: [عربی]/*اسم*. ڕۆژووشکێن؛ ئەوەی ڕۆژگ دەشکێنێ.

**مفعول** / maf'ûl ، ـها/: [عربی]/*اسم*. ۱. *[دستور]* بەرکار؛ وشەیێ کە مەبەستی کردار پێک‌دێنێ و کار سەبارەت بەو دەکرێت ۲. *[کنایی]* بدەر؛ قووندەر؛ کوڕ یان پیاوێ کە سواری بن.

▣ **مفعول باواسطه**: *[دستور]* بەرکاری ناڕاستەوخۆ؛ ناوێ کە بە هۆی وشەی سەربارەوە دەبێتە بەرکار (وەک «خانه: ماڵ» و «آرام: ئارام» لەم دوو ڕستەدا: آزاد از خانه آمد، آسو به آرام گفت: ئازاد لە ماڵەوە هات، ئاسۆ بە ئارامی گوت): **مفعول غیرصریح**

مفعول بی‌واسطه: *[دستور]* بەرکاری ڕاستەوخۆ؛ ناوێ کە بەبێ وشەی سەربار دەبێتە بەرکار (وەک «آزاد: ئازاد» لەم ڕستەدا: آرام آزاد را دید: ئارام ئازادی دی): **مفعول صریح**

مفعول صریح ☜ **مفعول بی‌واسطه**

مفعول غیرصریح ☜ **مفعول باواسطه**

**مفقود** / mafqûd ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. گم؛ گوم؛ گووم؛ ون؛ وندا؛ نادیار؛ بزر؛ بەرزە؛ ونبوو؛ سڕنەگوم. هەروەها: **مفقود شدن**

**مفقودالاثر** / mafqûdol'asar ، ـها/: [عربی] *صفت*.

بێسەروشوێن؛ مەرگوجێ؛ وندا؛ هامووتا؛ گومەسار؛ بێناونیشان ‹مدتها مفقودالاثر بود و تصور می‌شد مرده است: ماوەیەکی زۆر بێسەروشوێن بوو، وەیان دەزانی مردووە›.

**مفلس** / mofles ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.* ۱. هەژار؛ مایەپووچ؛ نەدار؛ بێپارە؛ بێزەڕ؛ دەستەنگ ۲. *[نامتداول]* نابووت؛ باردە؛ مافنگی؛ مافندی؛ دەملەپووش؛ تەواو رووت و نەدار.

**مفلسی** / moflesi/: *اسم.* نەداری؛ مایەپووچی؛ نابووتی؛ مافندی؛ دەم لە پووشی؛ بار و دۆخی تەواو رووت و نەدار بوون.

**مفلوج** / maflûc ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* گۆچ؛ گۆت؛ ئیفلیج؛ کوچ؛ فەلەج؛ بە ئەندامی گیڕ و ناتەواوەوە: **افلیج**

**مفلوک** / maflûk/: [عربی] *صفت.* کلۆل؛ کولۆل؛ کۆلەوار؛ کۆتەر؛ چارەڕەش؛ بێچارە؛ بە دۆخی شێواو و پەرێشان لە بەر نەداری ‹پیرزن مفلوک: پیرەژنی کلول›.

**مفنگی** / mofangî ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* مردال؛ مردەلە؛ مردەلۆخە؛ دالگۆشت؛ مردوولە؛ لەڕ؛ فێقن؛ فێق؛ مەرووز؛ مەرەزار؛ قرخ؛ لەجەر؛ قرخن؛ زۆر لەڕ و لاواز و کز و کەنەفت ‹با این هیکل مفنگی می‌خواهد کشتی هم بگیرد!: بەم هەیکەلە مردالەوە دەیهەوێ زۆرانیش بگرێ!›.

**مفوض** / mofavvaz/: [عربی] *صفت.* پێدراو؛ راسپێردراو.

**مفهوم**[1] / mafhûm ، ـها؛ مفاهیم/: [عربی] *اسم.* چەمک؛ مەبەست: ۱. واتا؛ مانا؛ ئەوەی کە لە قسەیەک فام دەکرێت ‹مفهوم آزادی: چەمکی ئازادی› ۲. تێگەیشتە؛ ڕا و بۆچوونی کەس یان تاقمێک لەمەڕ شتێکەوە ‹مفهوم توحید در اسلام: مەبەستی تەوحید لە ئیسلامدا›.

**مفهوم**[2]: *صفت.* فامکردنی؛ تێگەیشتنی ‹حرفهایش مفهوم نبود: قسەکانی فام نەدەکرا›.

**مفید** / mofîd/: [عربی] *صفت.* بەکەلک؛ بەقازانج؛ بەهرەدار؛ بەفایدە؛ فەڕدار؛ بە کارهاتوو ‹کار مفید؛ حیوان مفید: کاری بەکەلک؛ ئاژەڵی بەقازانج›.

**مفینه** / mofîne/: *صفت. [گفتاری]* چڵمن؛ چرمن؛ کڵمن؛ چڵمشۆڕ ‹با دوتا بچەی مفینه راه افتاده آمده مهمانی: بە دوو منداڵی چلمنەوە هاتووە بۆ میوانی›.

**مقابر** / maqāber/: [عربی] جمعِ ☜ **مَقبَره**

**مقابل** / moqābel/: [عربی] *صفت.* بەرانبەر؛ بەرامبەر؛ ڕووبەڕوو؛ وەراوەر؛ هەمبەر؛ هەڤهەسۆ؛ هەنداڤ؛ هەنداو؛ هەندەق ‹صفحەی مقابل: لاپەڕەی بەرانبەر›.

**مقابلِ** / moqābele/: [عربی] *حرف.* لە بەرامبەر؛ لە بەرانبەر؛ جە وەراوەروو: ۱. ڕووبەڕووی؛ لە ڕاست؛ لە ئاست؛ ئیزبار؛ هەمبەر؛ هەنداڤ؛ هەنداو ‹مقابل دانشگاه کردستان: لە بەرامبەری زانکۆی کوردستانەوە› ۲. بەراوەژوو؛ پێچەوانە؛ چەپەوانە؛ بەرەولا یان چەمکێکی دژبەر ‹خوب، مقابل بد و تاریکی، مقابل روشنایی است: باش، لە بەرامبەر خراپ و تاریکی، لە بەرانبەر ڕووناکیدایە›.

**مقابله** / moqābele/: [عربی] *اسم.* ۱. ڕووبالی؛ ڕووباری؛ ڕووبەڕوویی؛ هۆملکێ؛ بەرامبەرکێ؛ بەرهەڵستی؛ بەربەرەکانێ؛ ملانێ؛ باشار؛ بەرامبەری؛ کار یان ڕەوتی پێکگرتن؛ بە بەر یەک هەڵکێشان؛ کەنایش؛ بە گژ یەکا چوون و لە ڕووی یەکدا وەستان ۲. *[نجوم]* دۆخی دوو تەنی ئاسمانی (وەک خۆرو مانگ) لە چاو بینەرێکی سەر زەویەوە، کاتێ کە کەوتبێتنە دۆخی ۱۸۰° درێژی جوگرافیایی لە ئاست یەکتر ۳. *[چاپ]* کاری بەرامبەرکردنەوە؛ تاقیکردنەوەی نموونەی چاپی لەڕووی دەسنووس.

**مقادیر** / maqādîr/: [عربی] جمعِ ☜ **مقدار**

**مقاربت** / moqārebat/: [عربی] *اسم.* نزیکی؛ سەرجێیی؛ کاری جووت بوونی ژن وپیاو بە مرازی جینسی.

**مقاربتی** / moqārebatî/: [عربی] *صفت.* نزیکی؛ دووانە ‹بیماری مقاربتی: نەخۆشی نزیکی›.

**مقارن / moqāren/:** [عربی] *صفت.* ۱. هاودەق؛ لێک‌دەق ‹این دو خط مقارن یکدیگرند: ئەم دوو هێڵە هاودەقی یەکترن› ۲. هاوکات؛ هاوزەمان ‹عروسی او مقارن بود با بمباران شهرهای کردستان: زەماوەندەکەی هاوکات بوو دەگەڵ بوردوومانی شارەکانی کوردستان›.

**مقارنه / moqārene/:** [عربی]/*اسم.* ۱. هاودەقی؛ لێک‌دەقی؛ بار و دۆخی هاودەق بوون ۲. *[نجوم]* جێگرتنی دوو یان چەن تەنی ئاسمانی لە سەر کەلوویەک ۳. *[نجوم]* بار و دۆخی دوو تەنی ئاسمانی کاتێ کە کەوتبێتنە نزیکترین مەودا لە چاوی بینەردا.

**مقاش / maqqāš ، ـها/:** [عربی]/*اسم.* ۱. مووچین ۲. پەنس؛ گیرەی دەستی بژیشکان ۳. سەولک؛ ئەستێولک؛ مەقارە؛ مەقاشە؛ مقاش؛ مەقاش؛ گازک؛ ماشک؛ ماشە * **منقاش**

**مقاصد / maqāsed/:** [عربی] جمعِ ☜ **مقصد**

**مقاطع / maqāte'/:** [عربی] ☜ **مَقطَع**

**مقاطعه / moqāte'e ، ـها/:** [عربی]/*اسم.* مەختە؛ مخته؛ قەبەڵ؛ پەیمان؛ کونترات؛ قونتەرات.

**مقاطعه‌کار / moqāte'ekar ، ـها؛ ـان/:** [عربی/فارسی]/*اسم.* پەیمانکار؛ کونتراتچی؛ مەختەکار؛ قەبەڵکار.

**مقاطعه‌کاری / moqāte'ekarî ، ـها/:** [عربی/فارسی]/*اسم.* پەیمانکاری؛ کونتراتکاری؛ مەختەکاری؛ قەبەڵکاری.

**مقال / maqāl/:** [عربی]/*اسم. [ادبی]* وتار؛ گوتار.

**مقالات / maqālāt/:** [عربی] جمعِ ☜ **مقاله**

**مقاله / maqāle ، ـها؛ مقالات/:** [عربی]/*اسم.* وتار؛ گوتار؛ نووسراوەیەک بە ۲۰۰ تا ۲۰۰۰۰ وشەوە بۆ بەلاڤۆکی دەورەیی، دامەزراوەی فێرکاری یان کۆڕێکی زانستی و پیشەیی کە تێیدا نووسەر بیر و ڕای خۆی لەمەڕ بابەتێکەوە دەربڕیوە.

**مقام / maqām/:** [عربی]/*اسم.* ۱. ـها؛ ـات/ مەقام؛ کار؛ پیشە؛ کاربەند بەتایبەت کاری بەرزی مەرزینگەیی ۲. ـها؛ ـات/ پایەدار؛ خاوەن کارێکی وەها ۳. جێگا؛ جێگە؛ پێگە ‹تو در مقام تصمیم گرفتن نیستی: تۆ لە جێگای بڕیارداندا نیت› ٤. ـها/ جا؛ زێ؛ پایە؛ پلە؛ جێ‌پێ؛ پلە و پایە؛ پێگە ‹سعدی در ادبیات جهان مقام بلندی دارد: سەعدی لە وێژەی جەهاندا پلەیەکی بەرزی هەیە› ٥. *[موسیقی]* ـها/ مەقام؛ چۆناوچۆنی کەوتنە پەنا یەکتری پەردە و نیوپەردە لە مەودای نێوان هەشت نوتی یەک خولدا.

**مقامات / maqāmāt/:** [عربی] ۱. جمعِ ☜ **مقام** ۲. جمعِ ☜ **مقامه**

**مقامه / maqāme ، ـها؛ مقامات/:** [عربی]/*اسم. [قدیمی]* مەقامە؛ شێوازێک لە پەخشان‌نووسی بە شێوەی وتارێکی هەواڵی.

**مقاوم / moqāvem/:** [عربی] *صفت.* خۆڕاگر؛ بەرگەگر: ۱. خۆگر؛ باشارکەر ‹نیروی مقاوم در برابر باد: هێزی خۆڕاگر لە هەمبەر باوە› ۲. گورخ؛ گورێخ؛ پلپ؛ ڕێختە؛ ڕەختە؛ بەدەوام؛ پایار؛ ڕاوەستاو ‹این خانه مقاوم است: ئەم ماڵە گورێخە› ۳. چەق؛ کێشدار؛ چیڕ؛ جیڕ؛ خۆگر و نەپس ‹طناب مقاوم: گوریسی بەرگەگر›.

**مقاومت / moqāvemat/:** [عربی]/*اسم.* ۱. ـها/ باشار؛ خۆڕاگری؛ بەرگەگری؛ بەرگری: *الف)* کار و ڕەوتی بەرگەگرتن؛ دەربردن؛ دەگەڵ دەرد و دژواریدا هەڵکردن *ب)* پتەوی؛ گورێخی؛ ڕاوەستاوی؛ ڕەختەیی؛ پایاری؛ بەدەوامی ۲. *[برق]* ماکێک بۆ کەمکردنەوەی گەڕانی کارەبا، یان لێ داخستنی ولتاژ لە خولگەیەکی کارەباییدا ۳. *[زیست‌شناسی]* بەرگەگری؛ خۆڕاگری؛ لێهاتوویی لەش بۆ بەتاڵ کردنەوەی گەندەڵکاری هۆکارێکی دەرەکی.

▣ مقاومت ظاهری: *[برق]* باشاری ڕواڵەتی؛ سەرجەمی خۆڕاگری بەدیهاتوو لە ماکێکدا لە هەمبەر گەڕانی کارەباوە.

مقاومت مخصوص ☜ **مقاومت ویژه**

مقاومت مصالح: خۆڕاگری/ باشاری کەرستە و پەسای قورەکاری.
مقاومت منفی: *[سیاست]* باشاری ئەهوەن؛ بەربەرەکانێی هێمن و ئارام بەبێ قەڵسی و توورەیی لە بەرامبەر هێزی دەسەڵاتداردا.
مقاومت ویژە: *[برق]* باشاری تایبەت؛ ڕێژەی خۆڕاگری ماکێک لە هەمبەر گەڕانی کارەبا بە گوێرەی ئوهم‌میتر: **مقاومت مخصوص**
**مقایسه** / moqāyese ، ـها/: [عربی]/*اسم*. کار و ڕەوتی پێک‌هەڵسەنگان؛ لێکدانەوە؛ بەرامبەر کردنەوە؛ کار و ڕەوتی نیشاندانی ویکچوویی و جیاوازی نێوان چەن شت، کەس یان بار و دۆخ بە مەبەستی هەڵسەنگاندنیان ‹این دو قیمت را با هم مقایسه کردیم: ئەو دوو نرخەمان پێک هەڵسەنگاند›. هەروەها: **مقایسه شدن؛ مقایسه کردن**
**مقایسه‌ای** / moqāyese'î/: [عربی] *صفت*. بەراوردی؛ لێکدانەوەیی؛ لێکنەهانی؛ سەر بە پێک‌هەڵسەنگان و لە بەر یەک ڕانان ‹زبان‌شناسی مقایسه‌ای: زمانناسی بەراوردی›.
**مقبره** / maqbare ، ـها؛ مقابر/: [عربی]/*اسم*. هەجەر؛ گۆڕستان؛ زیارەتان؛ چاک و پیر؛ زێوە.
**مقبول** / maqbûl/: [عربی] *صفت*. ۱. جێ‌پەسەند ‹حرفش مقبول است: قسەکەی جێ‌پەسەندە› ۲. وەبەردڵان؛ دڵخواز؛ دڵواز؛ دڵنشین؛ دڵپەسن ‹دختر مقبولی است: کچێکی وەبەردڵانە›.
**مقبولیت** / maqbûlîyyat/: [عربی]/*اسم*. وەرگیراوی؛ پەسەندکراوی؛ پەسەن‌کریاگی؛ دۆخ یان چۆنیەتی جێ‌پەسند بوون.
**مقتبس** / moqtabes/: [عربی] *صفت*. وەرگیراو؛ هەڵگیریاگ؛ ژێ‌وەرگرتە.
**مقتدا** / moqtadā/: [عربی]/*اسم*. پێشوا؛ سەرۆک؛ ڕێبەر؛ ڕابەر.
**مقتدر** / moqtader/: [عربی] *صفت*. دەسەڵاتدار؛ بە دەسەڵات؛ دەس‌ڕۆیشتوو؛ هێزان؛ هێزدار؛ هۆمام؛ بەهێز، بەتایبەت خاوەن هێزی بەڕێوەبەری ‹دولت مقتدر: دەوڵەتی دەسەڵاتدار›.
**مقتدرانه** / moqtaderāne/: [عربی/ فارسی] *قید*. بەهێزەوە؛ هێزدارانە؛ دەسەڵاتدارانە ‹در مدت ریاست مقتدرانه عمل کرد: لە ماوەی سەرۆکایەتیدا بەهێزەوە کاری کرد›.
**مقتصد** / moqtased ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت*. ماڵ‌پارێز؛ ماڵدار؛ دەس‌پێوەگر ‹خانمش خیلی مقتصد است: ژنەکەی زۆر ماڵ‌پارێزە›.
**مقتضا** / moqtazā ، ـها؛ مقتضیات/: [عربی]/*اسم*. پێداویستی؛ نیاز ‹به مقتضای موقعیت عمل کنید: بە پێی پێداویستی بار و دۆخ بجووڵنەوە›: **مقتضی**
**مقتضی** / moqtazā/: [عربی] ☜ **مقتضا**
**مقتضی** / moqtazî/: [عربی] *صفت*. شیاو؛ گونجاو؛ لەبار؛ دەرخۆر؛ شایستە ‹اقدام مقتضی به عمل آید: کاری شیاو بکرێ›.
**مقتضیات** / moqtazîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مقتضا**
**مقتول** / maqtûl ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/*اسم*. کوژراو؛ کوژاو؛ کوژیاگ؛ کوشیا ‹مقتول از مخالفان دولت بود: کوژراوەکە لە نەیارانی دەوڵەت بوو›.
**مقدار** / meqdār ، ـها؛ مقادیر/: [عربی]/*اسم*. هێندە؛ هێند؛ هەند؛ هند؛ هاندۆ؛ بڕ؛ چەند؛ چەندە؛ ئەوەندە: ۱. ئەندازە ‹مقدار چهار کیلو هروئین کشف شد: هێندەی چوار کیلۆ هیرۆیین دۆزرایەوە› ۲. ڕێژە؛ چەنیەتی ‹هر مقدار که می‌توانی پول با خودت بیاور: هەر چەندەی دەتوانی پووڵ لەگەڵ خۆت بێنە›.
**مقدر** / moqaddar ، ـات/: [عربی]/*اسم*. ۱. داندراو؛ دانراو؛ ئەوەی لە مێژەوە دەسنیشان‌کراوە و براوەتەوە ۲. چارەنووس؛ چارەنویس؛ ناوچاو.
**مقدس** / moqaddas/: [عربی] *صفت*. پیرۆز؛ هەزەخ: ۱. /ـها؛ ـان؛ ـین/ شیاوی ڕێز و پەرستین ‹وظیفه‌ی مقدس: ئەرکی پیرۆز› ۲. سەر بە خودا؛ بوونەوەری ئاسمانی ‹کتاب مقدس: کتێبی پیرۆز›

۳. /ـات/ زۆر هێژا و خۆشەویست ‹میهن مقدس: نیشتمانی پیرۆز›.

**مقدسات** / moqaddasāt/: [عربی]/اسم. سەرجەمی ئەوەی پیرۆزە.

**مقدم** / maqdam/: [عربی]/اسم. ۱. بەرپێ؛ جێ‌پێ؛ جێ‌پا ۲. پێ‌وقەدەم؛ پاوقام؛ هەنگاو؛ هنگاو؛ هنگاڤ؛ هەنگاڤ؛ گاڤ؛ پێگاڤ ‹امیدوارم مقدم جنابعالی خیر باشد: هیوادارم پێ‌وقەدەمی بەڕێزتان خێر بێ›.

**مقدم** / moqaddam، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. [نامتداول] پێشنەگ؛ پێشنگ: ۱. بەرکەوت؛ وەرکەوت ‹شما در این کار مقدم بودید: ئێوە لەم کارەدا پێشەنگ بوون› ۲. پێش؛ بەر. بەرانبەر: **مؤخّر** ‹وقتی رسیدند او بر همه مقدم بود: کاتێ گەیشتنە بەرەوە ئەو لە پێش هەمووان بوو› ۳. خاوەن هەڤیازی.

**مقدم** / moqdem، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. [نامتداول] دەستبەکار؛ دەس‌بەکار ‹مقدم بر علیه امنیت کشور: دەستبەکار دژی هێمنی ولات›.

**مقدمات** / moqaddamāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مقدمه**

**مقدماتی** / moqaddamātî/: [عربی] صفت. سەرەتایی؛ بەرایی ‹کلاس مقدماتی؛ تصمیم مقدماتی: پۆلی سەرەتایی؛ بڕیاری بەرایی›.

**مقدم‌السفرا** / moqaddamossofarā/: [عربی] /اسم. پێشەنگی بالوێزان؛ ئەو بالوێزە لە ولاتی بیانیدا کە لە هەموو بالوێزەکانی دیکە پێشینەی کاری زیاترە: **شیخ‌السفرا**

**مقدماً** / moqaddamatan/: [عربی] قید. پێشەکی؛ لە سەرەتادا؛ لە بەرا؛ وەلێنە ‹مقدماً چنین گفت...: پێشەکی ئاوای گوت...›.

**مقدمه** / moqaddame، ـها؛ مقدمات/: [عربی]/اسم. پێشەکی؛ دەسپێک: الف) سەرەتای کار ‹مقدمەی ساختمان: دەسپێکی خانووبەرە› ب) سەرەتای قسە کە پێش لە وتاری سەرەکی دەگوترێت ج) وەرپەڕە؛ نووسراوەیەکی زۆرتر کورت لە سەرەتای کتێبدا. بەرانبەر: **مؤخّره**

**مقدور** / maqdûr/: [عربی] صفت. بووزخۆر؛ کردنی؛ بە دۆخ یا چۆنیەتی لوان ‹آنچه مقدور است انجام دهید: ئەوەندەی بووزخورە جێبەجێ بکەن›.

**مقدورات** / maqdûrāt/: [عربی]/اسم. دەرفەت و توانایی پێویست بۆ ئەنجامدانی کارێک.

**مقدونی** / maqdûnî/: [عربی] صفت. مەقدوونی؛ سەر بە ولاتی مەقدوونیە لە بالکان.

**مقر** / maqar(r)، ـها/: [عربی]/اسم. بنکە؛ بنە؛ مەکۆ؛ مەکۆگە؛ نیشتگە؛ بارخانە؛ شوێنی مانەوە و جێبەجێ‌کردنی کار و بار ‹مقر پلیس: بنکەی پولیس›.

**مقر** / moqer(r)/: [عربی] صفت. موکور؛ مکوڕ؛ ددان پێداهێن؛ پێ‌لێن؛ تایبەتمەندی کەسێ کە ددان دەنێ بە کردەوە یان باوەڕێکدا، پێ دێ و دەیدرکێنێ.

▣ مقر آمدن: [گفتاری] دان پێدانان؛ پێ لێنان؛ پێ هاتن ‹عاقبت مقر آمد و همه چیز را گفت: ئاخری ددانی پێدانا و هەموو شتێکی دەرخست›.

**مقراض** / meqrāz، ـها/: [عربی] [ادبی] ☜ **قیچی**

**مقرب** / moqarrab، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. نزیک؛ نێوان‌خۆش؛ لێک نێزیک ‹او می‌خواست خودش را پیش رییس مقرب کند: دەیەویست خۆی بە سەرۆک نزیک بکاتەوە›.

**مقرر** / moqarrar، ـات/: [عربی] صفت. بڕیار؛ بڕیاردراو؛ بڕیار لە سەر دراو؛ بڕاوە وەک قانوون، دەستوور یان بەڵێنێک ‹از این تاریخ مقرر می‌شود کارت شناسایی خود را همراه داشته باشید: بڕیار ئەوەیە لەمڕۆ بەدواوە، پێناسەکەتان بەلاوە بێ›.

**مقررات** / moqarrarāt/: [عربی]/اسم. پێودان؛ کۆی ئەو شتانەی بڕیاری لە سەر دراوە ‹مقررات ساختمانی: پێوەدانی خانووبەرە›.

**مقرراتــی** / moqarrarātî/: [عربـی] *صـفت.* بــه پێوەدان؛ پێداگر لە سەر بڕیار و بەڕێوە بردنی.

**مقرری** / moqarrarî ، ـها/: [عربی]/*سم.* مووچـە؛ پارەی بڕاوە کە مانگانە دەدرێـت ‹بـرایش مقـرری مختصـری تعیـین کردنـد کـه هـر مـاه بـرود بگیـرد: مووچەیەکی کەمیان بۆ بڕیەوە مانگانە بیگرێ›.

**مقرنس** / moqarnas ، ـها/: [معرب از فارسی]/*سم.* *[معماری]* ژێرتاق؛ موقەڕنەس؛ هێشـووی ڕازاوەی گەچی لە کونجی دیو یان شوێنی پێکەوە لکانی بنمیچ و دیواردا.

**مقروض** / maqrûz ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی] *صـفت.* قەرزار؛ قەرزدار ‹از وقتی خانه خریده به همه مقروض اسـت: لـەو سـاوە مالـی کـڕیوە، قـەرزاری هـەموو کەسێکە›.

**مقرون** / maqrûn/: [عربی] *صفت.* ۱. تـەبا؛ سـاز؛ سازگار ۲. نزیک؛ نێزیک.

**مقـره** / maqarre ، ـهـا/: [عربـی]/*سم.* مـەکارە؛ قرقـڕەی تێوەپێچـانی سـیم و تـەلی کارەبـا و تەلەفوون کە لە جنسی جۆری چینیە.

**مقسم** / moqassem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی] *صـفت.* دابەشکەر؛ بەشکەر؛ بەشکەرەوە.

**مقسوم** / maqsûm ، ـهـا/: [عربـی]/*سم.* *[ریاضـی]* دابەشـــکراو؛ بەشـــکراو؛ دابەشـــکری (وەک لـــە ۵=۲÷۱۰ دا، ژمارەی ۱۰، دابەشکراوە): **بخشی**

**مقســـومعلیـــه** / maqsûm(on)'alayh,-'aleyh ، ـها/: [عربی]/*سم.* *[ریاضی]* پێ‌بەشکراو؛ ژمارەیـەک کە ژمارەیەکی‌تری بەسـەردا بـەش دەکرێتـەوە (وەک لـە ۵=۷÷۳۵ دا، ژمـارەی ۷، پـێ‌بەشـکراوە): **بخشیاب**

**مقصد** / maqsad ، ـها؛ مقاصد/: [عربی]/*سم.* ۱. بەر؛ وەر؛ مەنزڵ؛ شوێنی مەبەست لە ڕۆشـتندا ‹کـی بـه مقصـد رسـیدید: کـەنگێ گەیشـتنە بـەرەوە› ۲. ئامانج؛ دۆز؛ مەبەست.

**مقصر** / moqasser ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی] *صـفت.* تاوانبار؛ گونەکار؛ شەپنی؛ خەتابار ‹در چهـار مـورد مقصر شناخته شده است: لە چوار بابەتەوە بـە تاوانبـار ناسراوە›.

**مقصــود** / maqsûd ، ـهـا/: [عربـی]/*سم.* نیـاز؛ مەبەست: ۱. مراز؛ مەرام ‹مقصود خرید خانه است: نیاز کڕینی ماڵە› ۲. ویست؛ مانا؛ ئامانج ‹نفهمیدم مقصود او از این کار چه بود: نەمزانی مەبەسـتـی لـەم کارە چ بوو›.

**مقطر** / moqattar/: [عربی] *صفت.* تکـاو؛ داتکـاو؛ تنۆکاو؛ تایبەتمەندی تراوێ کـە لـە کوڵانـدن و کردنـە هەڵـم و سـاردکردنەوەی ئـەو هەڵـمە پێکهاتووە.

▣ آب مقطر ☜ آب

**مقطع** / maqta' ، ـها؛ مقاطع/: [عربـی]/*سم.* برگـە: ۱. شوێنی بـڕان یـا قرتـانی شـتێک ۲. قۆنـاغ؛ قۆناخ؛ هەر کام لە پاژگەلی جیاجیای ڕەوت یان ڕووداوێ ۳. قاش؛ بڕشت؛ کـووز؛ بـڕ؛ پـاژی بـە بڕین لێوەکراو ٤. *[ادبی]* دوامین بەیتی شیعریک (وەک غەزەڵ، قەسیدە).

▣ مقطع تحصیلی: قۆناغی خوێندن؛ هەر کام لـە پاژگەلی ڕەوتی خوێندەواری (وەک سەرەتایی، ناوەندی و...) کە بۆ چوونە پاژی سەرتر، تێپەڕ کردنی پێویستە.

مقطـع زمـانی: قۆنـاغی کـاتی؛ سـەردەمێکی دیاریکراو لە زەمان.

**مقطع** / moqatta' ، ـها/: [عربی] *صفت.* بڕە ــ بڕە؛ تیکە ـ تیکە؛ بڕگە ـ بڕگە؛ پچڕ ـ پچڕ؛ کوتە ـ کوتـە؛ لەت‌وکوت؛ پچڕاو؛ پارچە ـ پارچە: **قطعه ـ قطعه**

**مقطوع** / maqtû'/: [عربی] *صفت.* ۱. بڕاوە؛ بـڕیار لە سەردراو ‹قیمت مقطوع: نرخـی بـڕاوە› ۲. بـڕاو؛ پچڕاو ‹مقطوع النسل: دوابڕاو›.

**مقطـوع‌النسـل** / maqtû'onnasl ، ـهـا/: [عربـی] *صفت.* ۱. دوابڕاو؛ دوابڕیاگ ۲. گونبڕاو؛ خەسـاو؛ خەسیو؛ خەسیاگ.

**مقعـد** / maq'ad/: [عربـی]/*سم.* قنـگ؛ کونـگ؛ کووین؛ قـوون؛ عـوون؛ کنـگ؛ قـن؛ تـن؛ عنـە:

۱. سمت؛ سمته؛ ئەو بەشەی لەش کە بە سەریەوە دادەنیشن ۲. [مجازی] سوو؛ خرک؛ زرتک؛ کووم؛ پند؛ قولتەفسە؛ قوونگ؛ کۆم؛ کن؛ تریزە؛ بالوور؛ پۆز؛ پندرۆ؛ پنگ؛ کونی قنگ.

**مقعر** / moqa'ar/: [عربی] صفت. کوور؛ کۆد؛ قولۆر؛ ناقچال؛ قووپاو؛ داقوپاو؛ چاڵ هەڵگەڕاو وەک ناوی کاسە.

**مقعرالطرفین** / moqa'arottarafeyn/: [عربی] ☜ **دوکاو**

**مقفا** / moqaffā/: [عربی] صفت. [ادبی] بەپاشڵ؛ پاشڵدار؛ قافیەدار: **مقفی**

**مقفی** / moqaffā/: [عربی] ☜ **مقفا**

**مقلد** / moqalled ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] اسم. ۱. چاولێبڕ؛ چاولێکەر؛ لاساییکەر(ەوە)؛ ئەوەی چاو لە کەسی دی دەبڕێ ۲. [شیعە] موقەلید؛ ئەو کەسە لە کار و باری ئایینیدا، چاو لە دەمی مەلایە ۳. شانۆکاری لاساکەرەوە بۆ هێنانە پێکەنینی خەڵک.

**مقلوب** / maqlûb/: [عربی] صفت. پێچەوانە؛ چەپەوانە؛ هەڵەوگەڕاو؛ هەڵەوگەڕیاگ؛ سەرەنخوون؛ سەرەونخوون ‹مقلوب ماک می‌شود کام: پێچەوانەی ماک دەبێتە کام›.

**مقمپز** / moqampoz ، ـها؛ ـان/: صفت. فیزن؛ ترزل؛ خۆ بەزل‌زان.

**مقنعه** / maqna'e ، ـها/: [عربی] اسم. کەڤنک؛ مەقنەعە؛ پۆشەنێ تایبەت بە ژنان کە سەر و مل دادەپۆشێ و دەموچاو بە دەرەوەیە.

**مقنن** / moqannen/: [عربی] اسم. قانوون دانەر؛ دەستووردانەر؛ کەسێ کە قانوون دادەنێ.

**مقننه** / moqannene, moqannane/: [عربی] صفت. قانوون‌دانەر؛ پێوەندیدار یان سەر بە قانوون‌دانەریەوە.

**مقنی** / moqannî ، ـها؛ ـان/: [عربی] اسم. قومەشکەن؛ قوموشکەن؛ کارێزکەن؛ چاکەن؛ کەنکەنەچی؛ ڕەهەندلێدەر؛ بیرهەڵکەن ‹مقنی بر اثر بخار چاه خفه شد: قومەشکەنەکە بە هەڵم و بۆقی بیرەکە خنکا›.

**مقوا** / moqavvā ، ـها/: [عربی] اسم. مقەبا؛ مقەوا؛ بەرهەمێکی سیلولوزی وەک کاغەز بەڵام نەختێ ئەستوورتر کە چەسپ و ماکی بریقەی تێ‌هەڵدەسوون و بۆ بەرگی کتێب و کارت و جەعبە کەڵکی لێ وەردەگرن.

**مقوائی** / moqavvā'î/: [عربی] ☜ **مقوایی**

**مقوایی** / moqavvayî/: [عربی] صفت. مقەبایی؛ مقەوایی؛ لە جنسی مقەوا: **مقوائی**

**مقولات** / maqûlāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مقوله**

**مقوله** / maqûle ، ـها؛ مقولات/: [عربی] اسم. بابەت: ۱. بەشێک لە نێو دەزگایەکی ڕیزبەنی کراودا ۲. چەمکی بەرباس و لێکۆڵینەوە.

**مقوم** / moqavvem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] اسم. نرخێنەر؛ نرخدانەر؛ کەسێ کە بایی شت دیار دەکا.

**مقوی** / moqavvî/: [عربی] صفت. بەهێزکەر؛ تواناییدەر؛ هێزدەر؛ هازدەر؛ هێزپێدەر ‹غذای مقوی: خۆراکی هێزدەر›.

**مقهور** / maqhûr ، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. بەزیو؛ بەزیا؛ تێک‌شکاو؛ بۆڕخواردوو.

**مقی** / moqay(y)/: [عربی] صفت. [پزشکی] هەڵهێنەرەوە؛ بە تایبەتمەندی هەڵهاوردنەوەوە.

**مقیاس** / meqyās ، ـها؛ ـات/: [عربی] اسم. ۱. ئەندازە؛ ئەنازە؛ گۆرەبا؛ میزان ‹در مقیاس وسیع: لە ئەندازەی بەریندا› ۲. پێوەر؛ پیوانە؛ ئەنگارە؛ پێوک؛ کەرستەی پێوان ‹مقیاس طول، متر است: پێوەری درێژایی، میترە›.

▣ مقیاس بومه: پێوەری بوومە؛ پێوەرێک بۆ پێوانی تۆکمەیی و خەستی تراو: **اِشل بومه**

**مقید** / moqayyad/: [عربی] صفت. ۱. بەستراو؛ بەندیوار؛ پێوەنددار؛ بە شتێکی ترەوە بەسراو ۲. پێبەند؛ پێخەم؛ دەربەست؛ بڕوامەند؛ دەربایس؛ پابەن؛ دەربەن؛ دەروەن ‹بە هیچ

مسلک و مرامی مقید نیست: پێبەندی هیچ ڕێباز و دۆزێ نیە› ٣. [گفتاری] پێبەند بە ئاکار و داب‌ودەستووری کۆمەڵایەتی.

**مقیم** / moqîm ، ـان/: [عربی] صفت. نیشتەجێ؛ هۆلس؛ ئارانشین؛ ئاری؛ ماندەنە؛ خۆجێ؛ ئێوری؛ جێمانی؛ جاگرتە؛ دانیشتوو؛ ئاری ‹او مقیم کرکوک بود: (ئەو) نیشتەجێی کەرکووک بوو›.

◘ **مقیم شدن**: نیشتەجێ بوون؛ ئاری بوون؛ هێورین؛ دانیشتوو بوون ‹مدتی در ایلام مقیم شد: ماوەیەک لە ئیلام نیشتەجێ بوو›. هەروەها: **مقیم بودن**

**مک** / mak, mek, mik/: اسم. مێژ؛ مەخت؛ مژ؛ ملک؛ مروس؛ مرێس.

◘ **مک زدن**: مژین؛ هەڵمژین؛ مژ لێدان؛ ملک لێدان؛ چەکاندن؛ چەکانن؛ مرێستن ‹انگشتش را مک می‌زد: قامکی دەمژی›.

**مک** / mok/: قید. [گفتاری] ڕێک؛ راست؛ مووک؛ سەرڕاست؛ بێ‌کەم و فرە ‹مک شد ٥٠ عدد: ڕێک بوو بە ٥٠ دانە›.

**مکاتب** / makāteb/: [عربی] جمعِ ☜ **مَکتَب**

**مکاتبات** / mokātebāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مکاتبه**

**مکاتبه** / mokātebe ، ـها؛ مکاتبات/: [عربی] اسم. نامەنووسی: ١. کاری نووسینی نامە ٢. نامە گۆڕینەوە.

**مکاتبه‌ای** [1] / mokātebe'î/: [عربی] صفت. بە دۆخ یان حاڵەتی نامەنووسی.

**مکاتبه‌ای** [2]: قید. بە نامە نووسینەوە؛ نووسراوەیی ‹با هم مکاتبه‌ای آشنا شدیم: بە نامە نووسینەوە ئاشنا بووین›.

**مکاتیب** / makātîb/: [عربی] جمعِ ☜ **مکتوب**

**مکار** / makkār ، ـها؛ ـان/: [عربی] صفت. [ادبی] فێڵەزان؛ فێڵباز؛ فێڵاوی؛ فێڵۆ؛ فەنەکباز؛ فەندار؛ فەنری؛ شەمچک؛ گزیکار؛ تەڵەکباز؛ تڵەکەباز؛ حیلەباز؛ گۆزاچخ؛ ئۆینباز؛ ڕیپۆکار؛ ڕیپۆ؛ وەگەڕ؛ بە حیلە؛ کۆنە؛ فریودەر؛ حەرامزا؛ عوێنباز؛ عەیار ‹روباه مکار: ڕێوی فێڵەزان›.

**مکارم** / makārem/: [عربی] جمعِ ☜ **مَکرُمت**

**مکاره** / makāre/: [روسی] ☜ بازار مکاره، **بازار**

**مکاری** / mokārî ، ـها؛ ـان/: [عربی] اسم. [قدیمی] چاروادار؛ ئوڵاغدار؛ خەربەندە؛ کەسێ کە بە کەر و قاتر و هێستر باری دەگواستەوە و کرێی وەردەگرت.

**مکاس** / mekās/: [عربی] صفت. [قدیمی] چەقە؛ چەقەچەق؛ کار و ڕەوتی پێدانەگەز و چەناکەدرێژی لە مامەڵەدا.

**مکاشفات** / mokāsefāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مکاشفه**

**مکاشفه** / mokāšefe ، ـها؛ مکاشفات/: [عربی] اسم. دیناو؛ لێ‌هاتنە دیار: ١. ئەوەی بە بیرکردنەوە و تێڕامان دەدۆزرێتەوە ٢. تەقالا و تێکۆشانی زەینی بۆ گەیشتن بە ڕاستی ٣. [تصوف] کار یان ڕەوتی ئاشکرا بوونی ڕووداو و بوونەوەرانی نادیار لە کەسێ، بە یارمەتی هێزی ئاسمانی.

**مکافات** / mokāfāt/: [عربی] اسم. ١. سزا؛ جزیا ٢. [قدیمی] پاداش؛ خەڵات ٣. [گفتاری] دەردیسەر؛ باری زەحمەت؛ گیر و گرفت؛ گرفتاری؛ دۆخی دژوار و ئازاردەر ‹این روزها پیدا کردن کار هم مکافاتی شده است: ئەمڕۆکە دۆزینەوەی کاریش بووەتە دەردیسەرێک›.

◘ **مکافات بودن**: [گفتاری] گرفتاری بوون؛ هۆی زەحمەت و دەردیسەر بوون.

**مکافات داشتن**: [گفتاری] کێشە هەبوون؛ گیرە و کێشە هەبوون؛ دەردیسەر هەبوون؛ تووشیاری زەحمەت و دەردیسەری بوون ‹با صاحب‌خانه مکافات داشتیم و کارمان بە کلانتری کشید: لەگەڵ خاوەن ماڵەکەدا کێشەمان هەبوو، کارمان گەیشتە کەلانتەری›.

**مکافات کشیدن**: [گفتاری] لە دەردیسەر بوون؛ جەورکێشان؛ زەحمەت و مەینەت دیتن ‹از دستش خیلی مکافات می‌کشیم: بە دەستیەوە زۆر

لە دەردیسەرین›.
**بە مکافات عمل رسیدن: سزای کردەوەی خۆ بینین؛ سزا دیتن؛ جزیا دیتن** ‹آخر بە مکافات عملش می‌رسد: ئاخری سزای کردەوەی خوی دەبینێ›. **هەروەها: مکافات دیدن**
**مکالمات** / mokālemāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مکالمه**
**مکالمه** / mokāleme/: [عربی]/اسم. ۱. /ـها؛ مکالمات/ وتوویژ؛ مچلکە؛ کاری یەک دواندن؛ هەڤپەیڤین ‹مکالمەی تلفنی: وتوویژی تەلەفوونی› ۲. ئاخافتن؛ دەرسی قسەکردن بە زمانێکی بیانی ‹مکالمەی انگلیسی ۲۰ گرفتم: وتوویژی ئینگلیسی ۲۰م گرت›.
**مکان** / makān ، ـها/: [عربی]/اسم. شوێن؛ شۆن؛ جێ؛ جی؛ جێگا؛ جێگە؛ جیە؛ جیک؛ لۆر؛ یاگێ: ۱. ماوا؛ سۆر؛ ئاست؛ یاتاخ؛ بۆشاییێ کە شتێک دایگرتووە یان تێدایە ‹هر چیز را باید در مکان خود گذاشت: هەر شتێک دەبێ لە شوێنی خۆی دابنرێ› ۲. /اماکن؛ امکنە/ ئاقار؛ خانووبەرە یان جێگای تایبەت ‹مکان مسکونی: شوێنی نیشتەجێیی› ۳. بووم؛ ئاقار؛ دەڤەر، ناوچە یا ناوەندی دیاریکراو ‹مکان حفاظت شدە: شوێنی پاوانکراو› ٤. ئاست؛ ئاقار؛ بەشی دیاریکراو لە رووپەڕ یان تەنێک ‹مکان علامت‌گذاری شدە: جێگای نیشانکراو› ٥. پایەگا ‹مکان استقرار نیروها: جێی سەقامگری هێزەکان›.
◙ **مکان هندسی**: شوێنی هەندەسی؛ کۆمەڵە خاڵی سەر تەشکێکی هەندەسی کە هەموو یەک تایبەتمەندیان هەبێ.
**مکان شناسی** / makānšenāsî/: [عربی/ فارسی] /اسم. جێناسی؛ جێگاناسی؛ شوێن‌ناسی؛ توپولۆژی؛ کار و ڕەوتی توێژینەوەی شوێنێک لە باری پێوەندی دەگەڵ مێژوویدا.
**مکانی** / makānî/: [عربی] صفت. جێگەیی؛ شوێنی؛ پێوەندیدار یا سەر بە شوێنەوە ‹ویژگی مکانی: تایبەتمەندی جێگەیی›.
**مکانیابی** / makānyābî/: [عربی/ فارسی]/اسم. جێدۆزی؛ شوێندۆزی؛ کار و ڕەوتی دۆزینەوە و ناسینی شوێنی شیاو بۆ چالاکی خانووکردنەوە و شارسازی.
**مکانیزاسیون** / mekānîzāsyon/: [فرانسوی]/اسم. کار و ڕەوتی ماشێنی کردنەوەی کار و باران.
**مکانیزم** / mekānîzm/: [انگلیسی] ☜ **مکانیسم**
**مکانیزه** / mekānîze/: [فرانسوی] *صفت.* ماشینی؛ میکانیزە؛ جێبەجێکراو یان دروستکراو بە ماشین ‹تولید مکانیزە: بەرهەمهێنانی ماشینی›.
**مکانیسم** / mekānîsm/: [فرانسوی]/اسم. ڕەوتانە؛ فەن یان ڕەوتێ بۆ گەیشتن بە ئاکام: **مکانیزم**
**مکانیسین** / mekānîsyan/: [فرانسوی] ☜ **مکانیک ـ۲**
**مکانیک** / mekānîk/: [فرانسوی]/اسم. میکانیک: ۱. بەشێک لە زانستی فیزیک کە دەپەرژێتە سەر وزە و هێز و کاریگەریان لە سەر تەن ‹مهندس مکانیک: ئەندازیاری میکانیک› ۲. /ـها/ کەسێ کە پیشەی دروستکردنەوەی ماشین بەتایبەت ئوتومبیلە: **مکانیسین** ✱ **میکانیک** *[گفتاری]*
◙ **مکانیک خاک**: زانستی لێکدانەوەی خاک لە بواری جۆر، پێکهاتە، خۆڕاگری و هێزی مژینەوە.
مکانیک سیالات: میکانیکی تەوش؛ بەشێک لە زانستی فیزیک کە دەپەرژێتە سەر تەوش لە وەستان و بزووتندا و لە سەر پاڵ، خێرایی، لەز و گۆڕانی بیچم، کەڵەکەیی و فل بوونەوە دەکۆڵێتەوە.
مکانیک کوانتوم: لقێک لە فیزیکی نوێ کە دەپەرژێتە سەر ماک و هێز و چۆنیەتی جێ‌گۆڕکێ‌کردنیان بەبێ لە بەرچاوگرتنی فیزیکی کلاسیک.
**مکانیکی**[1] / mekānîkî/: [فرانسوی]/اسم.

میکانیکی: ۱. ـها/ کارگای کەڵتە و دروست کردنەوەی ماشین ۲. کاری میکانیک * **میکانیکی** *[گفتاری]*

**مکانیکی**[۲]: *صفت.* میکانیکی: ۱. پێوەندیدار بە ماشینەوە ۲. سەر بە گوێرەی قانوونی زانستی میکانیک.

**مکانیکی**[۳]: *قید.[مجازی]* وەک ماشین؛ میکانیکی؛ بە شێوەی ماشینی؛ بێ‌کەڵک‌گری لە چالاکی زەینی ‹مکانیکی کار کردن آدم را فرسوده می‌کند: وەک ماشین کار کردن مرۆ دەپرووکێنێ›.

**مکبی** / mokebbî/: [عربی] ☜ **ناپیوش**

**مکتب** / maktab، ـها/: [عربی]/اسم. قوتابخانە؛ مەکتەب: ۱.[قدیمی] فێرگە؛ خوێندگە؛ خوێندنگە؛ مەدرەسە ۲. مەکتەبخانە ۳. /مکاتب/ رێباز؛ ئایین یا ئامۆژەیەکی تایبەت ‹مکتب کانت: قوتابخانەی کانت› ٤. /مکاتب/ شێواز؛ رێباز؛ شێوەی هونەری یان ئەدەبی ‹مکتب رمانتیسم: قوتابخانەی رۆمانتیسم؛ مکتب کوبیسم: قوتابخانەی رۆمانتیسم؛ مەکتەبی کووبیسم›.

▣ **مکتب عینی** ☜ **برونگرایی**

**مکتبخانه** / maktabxane، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم.[قدیمی] مەکتەبخانە: ۱. فێرگەی نادەوڵەتی و نارەسمی کە تێیدا منداڵانیان فێری خوێندنەوە و نووسین، قورئان و... دەکرد ۲. دەبستان؛ قوتابخانەی سەرەتایی.

**مکتبدار** / maktabdār، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] اسم.[قدیمی] قوتابخانەدار؛ بەرپرسی قوتابخانە؛ مامۆستا و بەڕێوەبەری قوتابخانە.

**مکتبی** / maktabî/: [عربی] صفت. قوتابخانەیی؛ مەکتەبی؛ پێوەندیدار یان هاوگەری قوتابخانە.

**مکتسب** / moktasab/: [عربی] صفت. بەدەس‌هاتوو؛ دەس‌کەوتوو؛ رادەست ‹مال مکتسب: سامانی بەدەس‌هاتوو›.

**مکتشف** / moktašef، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. دۆزەرەوە؛ دەرخەر؛ کەسێ کە شتێکی (بەتایبەت زانستی) دەدۆزێتەوە.

**مکتوب**[۱] / maktûb، ـها؛ ـات؛ مکاتیب/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* نامە؛ نووسراوە.

**مکتوب**[۲]: *صفت.[ادبی]* نووسراو؛ نووسیاگ.

**مکتوبات** / maktûbāt/: [عربی]/اسم. نووسراوەگەل؛ نووسراوان؛ کۆمەڵەنامە ‹مکتوبات مولانای رومی: نووسراوەگەلی مەولانای رۆمی›.

**مکتوم** / maktûm/: [عربی] صفت. نهێنی؛ سەرپۆشراو؛ داپۆشراو؛ شاراوە (سەبارەت بە وتە) ‹فعلا بهتر است مکتوم بماند: جارێ باشتر وایە نهێنی بێ›.

**مکث** / maks، ـها/: [عربی]/اسم. گت؛ هاش؛ ئێس؛ درەنگ، بەتایبەت بۆ ماوەیەکی کورت ‹کمی مکث کرد و بعد جواب داد: نەختێک گتی کرد و پاشان وەڵامی داوە›.

**مکدر** / mokaddar/: [عربی] صفت. ۱. خەمبار؛ خەمگین ‹چهرەی مکدر: سیمای خەمبار› ۲. رەنجاو؛ ئازراو؛ گەهراو ‹به گمانم از حرف من مکدر شده است: پێم وابێ لە قسەکەم رەنجاوە›.

**مکر** / makr، ـها/: [عربی]/اسم. فێڵ؛ گەڕ؛ تەڵەکە؛ گز؛ ئاین و ئۆین؛ ئان و ئۆن؛ چیل؛ لەبان؛ فوون؛ چاچۆڵە؛ کەڵەک؛ فەن؛ داو؛ دەلەسە؛ لێبەک؛ پێچ و پلوچ؛ حیلە و حەواڵە؛ شندی‌مندی؛ هەنگ؛ فاک و فیک ‹از مکر او غافل مباش!: لە فیلی وی بێ‌ئاگا مەبە!›.

**مکرر** / mokarrar/: [عربی] صفت. پەسای پەس؛ پەیتا پەیتا؛ هەیتا هەیتا؛ پەسا پەسا؛ پەساپەس؛ یەک لە دوویەک.

**مکرراً** / mokarraran/: [عربی] قید. لە پەستا؛ پەسا ـ پەسا؛ پەساپەس؛ هەیتا ـ هەیتا؛ یەک لە دوای یەک؛ لێکدا ـ لێکدا؛ بەبێ وچان ‹مکرراً زنگ می‌زند: لە پەستا تەلەفوون دەکا›.

**مکرم** / mokarram/: [عربی] صفت. بەڕێز؛ رێزدار؛ جێ‌ڕێز ‹دوست مکرم: دۆستی بەڕێز›.

**مکرمت** / makramat، ـها؛ مکارم/: [عربی]/اسم.

۱. چاکە؛ خاسی؛ باشی ۲. گەورەیی؛ ڕێزداری.

**مکرمــــه** / makrome, makrame/: [؟]/سم. مەکرومە؛ جۆرێک تۆڕی دەستکرد لە دەزوو، بەن یان بزگوڕی چەرم بە گرێ و نەخشی جۆراوجۆرەوە.

**مکرمەبافی** / makromebāfî, makramé-/: [؟/ فارسی]/سم. مەکرومەچنی؛ کار و ڕەوتی چنین و دروستکردنی مەکرومە: **مکرمەدوزی**

**مکرمــەدوزی** / makromedûzî, makramé-/: [؟/ فارسی] ☜ **مکرمەبافی**

**مکــروه** / makrûh/: [عربی] صفت. ۱. کەسن؛ دزێو؛ نادروست؛ ناشیرین ۲. *[فقه]* مەکرۆ؛ مەکرۆهـ ؛ چۆنیەتی کارێک کە نەکردنی ڕاسپێراوە بەڵام کردنیشی بە گونا نانووسرێ.

**مکســر** / mokassar/: [عربی] صفت. *[نامتداول]* شکاو؛ شکیاگ؛ شکیاو؛ مڕیا.

**مکسور** / maksûr/: [عربی] صفت. ژێرەدار؛ بە نیشانەی ژێرەوە (وەک لە وشەی «نِگاه» دا، پیتی «ن» ژێرەدارە. ئەم نیشانە لە ڕێنووسی کوردیدا بۆتە «ی»).

**مکش** / makeš/: اسم. مژەک: ۱. مژ؛ مریس؛ مروس؛ کاری مژین ۲. کار و ڕەوتی هەڵمژین و هەڵکێشانی تەنێک بە کەمکردنەوەی گوشار لە سەر بەشێک لە ڕووپەڕی ۳. هێزێ کە بەم جورە بە کار دەچێ.

**مکشمرگ‌ما** / makošmargemā/: صفت. *[تعریض، گفتاری]* زاق؛ بە ڕواڵەتێکی سەرنجڕاکێش و نائاساییەوە ‹لباس مکش‌مرگ‌ما: جل‌وبەرگی زاق›.

**مکشوف** / makšûf/: [عربی] صفت. *[ادبی]* ئاشکرا؛ دیار؛ دەرکەوتوو؛ خویا ‹ناگهان چادر به کناری رفت و چهره‌اش مکشوف شد: لە ناکاو چارشێو لادرا و ڕوخساری ئاشکرا بوو›.

**مکشوفه** / makšûfe/: [عربی] صفت. دۆزراوە؛ دۆزراو؛ وەدۆزراو؛ ئەوەیۆزیا ‹اشیاء مکشوف: کەل‌وپەلی دۆزراوە›.

**مکعب** / moka'ab ، ـها/: [عربی]/سم. چوارپاڵوو؛ خشتەک؛ شەش‌ڕوو؛ هەشت‌سووچ؛ بیچمێ بە شەش ڕووی چوارگۆشی بەرامبەر و دوو بە دوو هاوشانەوە.

▣ مکعب مستطیل: چوار پاڵووی درێژ.

**مکعبی** / moka'abî/: [عربی] صفت. چوارپاڵوویی؛ خشتەکی؛ بە بیچمی چوار پاڵوویی.

**مکفی** / mokfî/: [عربی] صفت. بەس؛ بە ئەندازە؛ تا ئەو ڕادەیە کە بەش بکا.

**مک کارتیسم** / mak.kārtîsm/: [انگلیسی]/سم. مەک‌کارتیسم؛ ڕێبازێکی سیاسی کە لە لایەن جۆزف مەک‌کارتی (۱۹۰۸ـ۱۹۵۷)، سەناتۆری ئەمریکاییەوە سەری هەڵدا و بە بیانووی بەرگری لە دەستەڵاتی شۆرەوی (سۆڤیەت) بە سەر ئەمریکادا، ناونیتکەی لە نەیاران و بەتایبەت ڕۆشنبیران دەنا و لە چاو خەڵک سووک و چرووکی دەکردن.

**مکلا** / mokallā ، ـها؛ ـیان/: [از کلاه فارسی، به قیاس عربی] صفت. *[مجازی]* نامەلا؛ کلاوبەسەر؛ کلاوی.

**مکلف** / mokallaf ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. ۱. ئەرکدار؛ ئەرک‌لە سەر ۲. *[اسلام]* پێگەیشتوو؛ خاوەن تەمەن و بار و دۆخی پێویست بۆ جێبەجێ‌کردنی ئەرکی دینی.

**مک‌مکی** / mek-meki ، ـها/: اسم. مەمکەمژ؛ مەمیانە؛ مەملە؛ مەملەمژ؛ مۆستک.

**مکمل** / mokammel ، ـها/: [عربی] صفت. تەواوکەر؛ پڕکەر؛ پڕکەرەوە؛ پێ‌تەواو.

**مکمن** / makman ، ـها/: [عربی] *[ادبی]* ☜ **کمینگاه**

**مکنت** / meknat ، ـها/: [عربی]/سم. دەسچوویی؛ دارایی؛ دەسڕۆیی.

**مکنده** / makande/: صفت. مژۆک: ۱. بە تایبەتمەندی هەڵمژینەوە ۲. *[پزشکی]* ساکشین.

**مکنون** / maknûn ، ـات/: [عربی] صفت. *[ادبی]*

پەنام؛ پەنهان؛ داپۆشراو؛ شاراوە؛ نهێن؛ نەپەندی.
**مکنونات** / maknûnāt/: [عربی]/سم. ڕازگەل؛ نهێنیگەل؛ ڕازگەلی نەپەندی ‹مکنونات قلبی: ڕازگەلی دڵ›.
**مکی** / makkî/: [عربی] صفت. مەککی؛ مەکەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە شاری مەککە لە عەرەبسان.
**مکیدن** / mekîdan, makîdan/: مصدر. متعدی. // **مکیدی**: مژیت؛ **می مکی**: دەمژی؛ **بمک**: بمژە// ۱. مژین؛ مێژین؛ مێژتن؛ مژنن؛ مێژان؛ مژان؛ مژتن؛ هەڵمژان؛ هەڵمژین؛ مێشتن؛ مهتن؛ مێهتن؛ لتەن؛ چەکنەی؛ چەکنای؛ میسان؛ مریستن؛ مێستن؛ میتن؛ قەمشتن؛ ملکنای؛ ملۆسنایش؛ هل خوارن؛ ڕاکێشانی شتێ بۆ زار بە هێزی مژ ۲. بە دەست هێنان یان گرتنی شتێ بە هێزی مژ. هەروەها: **مکیدنی**
■ صفت فاعلی: **مکنده** (مژەر)/ صفت مفعولی: **مکیده** (مژراو)/ مصدر منفی: **نمکیدن** (نەمژین)
**مکیف** / mokayyef/: [عربی] صفت. بەکەیف؛ کەیفدار؛ کەیفهێن؛ خۆشیهێنەر.
**مکینه** / makîne/: اسم. ۱. *[نامتداول]* مژۆک؛ مژەک؛ پێمژ؛ ئامرازی مژین ۲. *[گیاەشناسی]* ڕیشاڵەی بڕێ گژ و گیای لامژ کە بژیوی خۆیانی پێ هەڵدەمژن.
**مگااهم** / megā'ohm/: [فرانسوی] ☜ **مگ‌اهم**
**مگاتریم** / megāteryom/: [فرانسوی]/سم. مگاتیریوم؛ گیانەوەری گیاخۆری وەک ورچ بە درێژایی ٦ میتر کە لە چەرخی چوارەمی زەویناسی لە ئەمریکادا ژیاوە.
**مگاژول** / megājûl/: [فرانسوی]/سم. میگاژوول؛ یەک ملیۆن ژوول.
**مگاسیکل** / megāsîkl/: [فرانسوی] ☜ **مگاهرتس**
**مگاوات** / megāvāt/: [فرانسوی]/سم. میگاوات؛ یەک ملیۆن وات.
**مگاهرتس** / megāherts/: [فرانسوی/ آلمانی]/سم. میگاهرتس؛ یەک ملیۆن هێرتس: **مگاسیکل**
**مگ اهم** / meg'ohm/: [فرانسوی]/سم. میگائوهم؛ یەک ملیۆن ئوهم: **مگااهم**
**مگر** [1] / magar/: قید. مەگەر؛ مەگە؛ مەر؛ ما؛ مەگەن؛ مەگین: ۱. ئەی؛ وشەی پرسیار ‹مگر نمی‌روی؟: مەگەر ناچی؟› ۲. وشەی مەرج ‹قبول نمی‌کند مگر تو هم باشی: وەری ناگرێ مەگەر تۆش ببی›.
**مگر** [2]: حرف. مەگەر؛ مەگە؛ مەر: ۱. بێجگە؛ بێجیەی؛ جگە؛ جگەم؛ جگە لە؛ ژبلی؛ بژلی؛ وشەی جیا کردنەوە ‹همه رفتند، مگر آزاد: هەموو ڕویشتن، بێجگە ئازاد› ۲. وشەی هەڕەشە ‹مگر دستم به تو نرسد!: مەگەر نەکەویتە دەستم!›.
**مگس** / magas/: اسم. ۱. *[نجوم]* هووڕمێش؛ وێنەیەکی ئاسمانی لە نێوان پەرگار و خاچی باشووری و گەمیەدا: **ذبابه** ۲. ـها؛ ـان/ مێش؛ مەش؛ مەشە؛ مەشی؛ مەگەز؛ مەگەس؛ مێروویەکی دوو باڵە لە هەموو دنیادا هەیە، لە سەر پیسایی و زبڵ و زاڵ گەرا دەکا و ڕاگوێزی زۆرێک نەخۆشی ئاژەڵ و مرۆیە.
▣ **مگس ارّه**: مۆز؛ مۆزک؛ جۆرێ مێش کە باڵی تا ٥٠ میلی‌میتر دەگا.
**مگس اسب**: خەرەنگەزە؛ کەرەنگێزە؛ مێشەکەرانە؛ مۆزەشینە؛ گولال؛ مۆزک؛ چیز؛ جۆرێ مێشی هێندێک گەورەیە بە ئاژەڵەوە دەدا و ڕاگوێزی بڕێ نەخۆشی ئاژەڵە بۆ مرۆ: **خرمگس، مگس خونخوار، مگس گاو، مگس چهارپایان**
**مگس پرزن**: تیرەیێ لە مێش کە مێتوولکەکەی ئافەتی پیازە.
**مگس تسه‌تسه**: جۆرێ مێشی هەڵگری ترپیانۆزوم (هۆی نەخۆشی خەو) لە ڕەگەزی مێشی ماڵی.
**مگس چهارپایان** ☜ **مگس اسب**
**مگس خانگی**: مێشی ماڵی.

**مگس خونخوار:** ☜ **مگس اسب**
**مگس سرکه:** مێشی سرکه/ ترشی؛ مێشێکی وردیله‌ی چاوسووره، زۆرتر له سه‌ر میوه‌ی فلێقاو و سرکه و شه‌راب ده‌نیشێته‌وه.
**مگس سگ** ☜ **مگس شپشی**
**مگس شپشی:** مێشاسه؛ میشه‌سه‌گانه؛ مێشه‌سانه؛ مێشه‌سه‌یانه؛ مێشه‌سه‌یه؛ مێشکاسه‌ی؛ جۆرێ مێشی سمره له نێو کولک و سه‌ر پێستی سه‌گدا دژی، چزی ئێشی زۆره و ئالۆش دێنێ: **مگس سگ**
**مگس گاوی** ☜ **مگس اسب**
**مگس میوه:** قاروونه؛ قه‌روونه؛ ئافه‌تێکی داری میوه‌یه، له نێو میوه‌دا گه‌را ده‌کا و که گه‌راکه‌ی هه‌لدێ گۆشتی میوه‌که ده‌خوا.
▣ **مگس پراندن:** *[کنایی]* مێش قه‌پاندن؛ مێش خه‌ساندن؛ خیاوان گه‌زکردن؛ گون ته‌قاندن؛ پا له په‌یین دان؛ ته‌واو بێکار و به‌تاڵ و قه‌تاڵ بوون ‹صبح تا شب نشسته‌ایم مگس می‌پرانیم: له به‌یانیه‌وه خه‌ریکی مێش‌قه‌پاندنین›.
**مگس‌پران** / magasparān ، ـها/: *اسم.* به‌رچاوکه؛ به‌رچاوه؛ به‌رچاویله؛ به‌رچاویلکه؛ ده‌سکردێکی ریشاڵ-ریشاڵ له هه‌ودای په‌ت و چه‌رم بۆ مێش ده‌رکردن له سه‌ر و چاوی چاره‌وا.
**مگسک** / magasak ، ـها/: *اسم.* نگ؛ برج؛ سیپه؛ سێره؛ سه‌هرک؛ سه‌به‌تانه؛ جاسووسه؛ مه‌گه‌سه‌ک؛ زیچکه‌ی سه‌ر لووله‌ی تفه‌نگ و شه‌ستیر بۆ نیشانه‌گرتن.
**مگس‌کش** / magaskoš ، ـها/: *اسم.* مێش‌کوژ؛ مه‌گه‌زکوژ؛ مه‌شکوش؛ که‌رسته‌یه‌ک بۆ لێدان و کوشتنی مێرووی باڵدار، به‌تایبه‌ت مێش.
**مگس‌گیر** / magasgîr/: *اسم.* ١. ـها؛ ـان/ هه‌نگه‌چین؛ هه‌نگه‌چنه؛ هه‌نگه‌خۆرکه؛ هه‌نگه‌خۆره؛ تیره‌یێ په‌له‌وه‌ری گچکه و پتر دارژی به ده‌ندووکی ته‌خت و بن‌پان و له‌شی راسته‌وه که به‌ته‌نێ ده‌ژین و نێر و مایان وه‌ک یه‌ک نیه: **مرغ مگس‌گیر؛ مرغ زرین‌پر** ٢. هه‌نگه‌چنه؛ هه‌نگه‌چینه؛ مێشگر؛ ته‌ڵه‌ی مێش؛ مێشگره؛ گیایێکی ده‌شته‌کی به گوڵی سپی یان سووره‌وه، مێرووی وردی باڵدار به سه‌ریه‌وه ده‌نیشن، گه‌ڵاکه‌ی لینجاویکی چه‌سپن ده‌ر ده‌دا و ده‌یانگرێ و ده‌یانخوا.
**مگس‌وزن** / magasvazn/: [فارسی/ عربی] *اسم.* کێشێ له ڕیزبه‌ندی وه‌رزشی مشت‌بازیدا تا ٥١ کیلۆ.
**مگنت** / magnet/: [انگلیسی] ☜ **ماگنِت**
**مگو** / magû/: *صفت.* *[گفتاری]* له وتن نه‌هاتوو؛ نه‌وتنی ‹راز مگو: ڕازی له وتن نه‌هاتوو›.
**مل** / mel/: *اسم.* مڵ؛ گه‌ردی نه‌رم و سپی، تێکه‌ڵاو له گه‌چی پاریس و گه‌ردی تالک که بۆ سپی‌کردنه‌وه و ڕه‌نگ‌کاری ماڵ، دروست‌کردنی میدادی گه‌چی و گه‌چی دروومان به‌کار دێ.
**مل** / mol/: *اسم.* باده؛ مه‌ی به‌تایبه‌ت شه‌راو.
**ملا** / mollā/: [از عربی] *اسم.* مه‌لا؛ مه‌لا: ١. ـها؛ ـان/ مامۆستای ئاینینی، به‌تایبه‌ت مامۆستای موسڵمان ٢. *[مجازی]* میرزا؛ خوێنه‌وار؛ ده‌رس خوێندوو و سه‌واددار ٣. *[مخفف]* مه‌لانه‌سره‌دین.
**ملأ** / mala'/: [عربی] *اسم.* پڕی؛ تژی؛ په‌یتاوی؛ که‌ڵه‌که‌یی. به‌رانبه‌ر: **خلأ**
▣ **در ملأ عام:** له پێش چاوی خه‌ڵکه‌وه؛ له به‌ر چاوی گشت؛ ده‌نێو خه‌ڵکیدا؛ له نێوان حه‌شاماتدا ‹روزه‌خواری در ملاء عام؟!: ڕۆژوو خواردن له پێش‌چاوی خه‌ڵکه‌وه؟!›.
**ملائکه** / malā'eke ، ـها؛ ملایک/: [عربی] *اسم.* *[گفتاری]* مه‌لایکه: ١. فریشته؛ مه‌لایه‌که‌ت ٢. کۆمه‌ڵی فریشته‌گه‌ل.
**ملات** / malāt/: [از عربی] *اسم.* مه‌لات؛ مه‌لات؛ هه‌ویری له قوڕ، ساروج، سیمان و... بۆ پێکه‌وه لێکاندنی خشت و به‌رد: **ملاط**
**ملاج** / malāc/: *اسم.* مه‌لاژی؛ مه‌لاژگ؛ مه‌لاشی؛ بۆلی؛ شلکه‌ی سه‌ر؛ به‌شی پێشه‌وه‌ی کاپۆڵ له

ژوور تەوێڵەوە تا تەپڵی سەر کە لە منداڵی ساوادا هێشتا نەگرساوە.

**ملاح** / mallāh ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. ١. مەلەوان؛ مەلیەوان ٢. زەریاوان؛ زرێوان.

**ملاحت** / malāhat/: [عربی]/اسم. خوێن‌شیرینی؛ دلڕفێنی (بۆ مرۆ، بەتایبەت کچ و ژن).

**ملاحظات** / molāhezāt/: [عربی]/اسم. ١. جمعِ ☜ ملاحظه ٢. تێبینی.

**ملاحظه** / molāheze ، ـها؛ ملاحظات/: [عربی]/اسم. هەمەت: ١. کار و ڕەوتی دیتن؛ بەردان؛ چاو لێ‌کردن ‹این را ملاحظه کنید: ئەمە ببینن› ٢. لێکدانەوە؛ وردکردنەوە؛ توێژینەوە ٣. هۆش پێوە بوون؛ بایەخ دان؛ ئاوڕ لێ‌دانەوە ‹خیلی ملاحظه‌ی او را داشتند: زۆریان هۆش پێوە بوو› ٤. نیشانک؛ بابەتێ کە لە بڕیار یا داوەریەکدا گرینگە ‹در انتخاب او ملاحظه‌های حزبی خیلی مؤثر بود: لە هەڵبژاردنی ئەودا هەمەتی حیزبی زۆر کاریگەر بوو› ٥. پەروا؛ پارێز ‹آن روز بدون ملاحظه همه‌ی حرفهایم را زدم: ئەو ڕۆژە بەبێ پەروا قسەی دڵی خۆمم کرد›.

▣ **ملاحظه داشتن**: ١. بەپارێز بوون ‹مثل اینکه از او ملاحظه داری: وا دیارە لێی بەپارێزی› ٢. لەبەرچاو بوون؛ لەپێش‌چاو گرتن ‹چرا ملاحظه‌ی بزرگتر را نداری؟: بۆ گەورەترت لەبەرچاو نیە› ❊ **ملاحظه کردن** ــ٥

**ملاحظه کردن**: ١. دیتن؛ دین؛ هێل کردن؛ چاو پێکەوتن؛ بەدی‌کردن ‹من چیزی ملاحظه نکردم: ئەمن شتێکم نەدی› ٢. لێکدانەوە؛ سەنگاندن ‹کتاب را بە دقت ملاحظه کرد: کتێبەکەی بەوردی لێکداوە› ٣. تێفکرین؛ تێڕوانین؛ تێڕامان؛ بیرکردنەوە؛ لێکۆڵینەوە ‹خوب کە ملاحظه کرد، دید کار او نیست: باش کە تێفکری، زانی کاری ئەو نیە› ٤. وریا بوون؛ خۆ پاراستن؛ هۆش هەبوون ‹کمی ملاحظه کن! نزدیک بود بیفتی: تۆزێ وریا بە! وەخت بو بکەوی› ٥. ☜ **ملاحظه داشتن**

**ملاحظه‌کار** / molāhezekār ، ـها؛ ـان/: [عربی/فارسی] صفت. پارێزکار: ١. بەپارێز ٢. کارقایم؛ قایمکار؛ دوورگر لە مەترسی. هەروەها: **ملاحظه‌کاری**

**ملاحی** / mallāhî/: [عربی]/اسم. مەلەوانی؛ زەریاوانی؛ کاری مەلەوان و زەریاوان.

**ملاخور** / mollāxor/: [از عربی/فارسی] صفت. مەلاخۆر؛ داگیرکراو لە لایەن مەلاوە.

▣ مُلاخور کردن: شتێک بە فێڵ و تەڵەکە بەلام بەبێ زۆر و شەڕ داگیرکردن.

مُلاخور شدن: ١. بە نامەردی فەوتان ٢. هەرزان بوون.

**ملازم** / molāzem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. هاوڕێ؛ هامڕا؛ وێڕا ‹هر دو ملازم یکدیگرند: هەر دووک هاوڕێی یەکن›.

**ملازمت** / molāzemat ، ـها/: [عربی]/اسم. هاوڕێیی؛ هەڤاڵەتی؛ هامڕایی.

**ملازمه** / molāzeme/: [عربی]/اسم. هاوڕێیەتی؛ هاوتەکی؛ دۆخی دوو یان چەند شت کە پێکەوە بەستراون.

**ملازه** / malāze ، ـها/: اسم. [قدیمی] بەلەزمانە؛ بەلەزوانە؛ ئەلەنگە؛ ئەلنگە؛ زمانۆک؛ زانک؛ زیل؛ زمانەچکۆلە.

**ملاس** / malās/: [فرانسوی]/اسم. ١. شەربەتی خەست و قاوەیی چەوەندەر کە نابێتە بلۆر و لە ڕەوتی بەرهەم هێنانی قەندا بەرهەم دێت ٢. گلواتە؛ تەلفارەی چۆنەری قەن.

**ملاط** / malāt/: [عربی] ☜ **ملات**

**ملاطفت** / molātefat ، ـها/: [عربی]/اسم. [ادبی] دلۆڤانی؛ مێهرەوانی؛ بە ڕوحمی.

**ملافه** / malāfe ، ـها/: [از عربی]/اسم. مەلافە؛ چەرچەف؛ سەرجێ؛ سەرجی؛ هویزار؛ ڕووە؛ پارچەی پان و نەرم بۆ سەر دۆشەکە یان ژێر پێخەف و پەتوو: **ملحفه**

**ملاقـات** / molāqāt ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. دیـدار؛ دیمانه؛ دیەنی؛ دیدەنی؛ پێرگین؛ پەرگین؛ کـار و ڕەوتی چاو پێکـەوتن ‹امـروز بـا رییس ملاقـات کـردم: ئەمـڕۆ دەگـەڵ سـەرۆک دیـدارم کـرد›. هەروەها: **ملاقات داشتن؛ ملاقات شـدن؛ ملاقـات کردن؛ به ملاقات کسی رفتن**

**ملاقـــاتی** / molāqātî ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. دیـەنی‌کـەر؛ کەسـێ کـە دەچێتـە دیـداری یەکێ‌تـرەوە (وەک نـەخۆش یـان بەنـدی) ‹امـروز ملاقاتی نداشتم: ئیمڕۆ دیەنی‌کەرم نەو›.

**ملاقـه** / malāqe ، ـهـا/: [از عربی]/اسـم. کەپچـە؛ کەوچێز؛ کەوجێز؛ کەوجز؛ کەشتێلـە؛ کشـتێل؛ کونـدەز؛ مـەلاک؛ ئەسـکوو؛ وسـکی؛ هەسـکە؛ هسکۆ؛ هەسکۆ؛ هەسکوێ؛ خەرشەب؛ قەلووخە؛ قوڵەغە؛ قەلووخ؛ ئەسـکوێ؛ ئەسـکو؛ چـەمچک؛ چەمچە؛ چمچە؛ کاسۆڵەی دەسک‌درێژ بۆ تـراو گۆزتنەوە: **ملعقه**

**مـلاک** / mallāk ، ـهـا؛ ـان؛ ـین/: [عربـی]/اسـم. مالک؛ خاوەن ملک (وەک زەوی و باخ).

**ملاک** / melāk ، ـها/: [عربی]/اسـم. پێومـان؛ ئـەو شتەی وەک بنەما بۆ داوەری یا نرخاندن ڕەچاو دەکـرێ ‹مـلاک گـزینش دانشـجو: پێومانـــی هەڵبژاردنی خوێندکار›.

**مـلال** / malāl ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. دڵـتەنگی؛ دڵێشـــاوی؛ وەڕەزی؛ ئـــازراوی؛ شـــەکەتی؛ ماندوویی ‹از فرط ملال نزدیـک بـه مـرگ بـودم: لـە تاوی دڵتەنگیدا خەریک بوو بمرم›.

**مـلال‌آور** / malālāvar/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. دڵتەنگ‌کەر؛ خەمهێنەر؛ خەمێنـەر؛ وەڕەزکـەر؛ شەکەتی‌هێن.

**ملالت** / malālat ، ـهـا/: [عربی]/اسـم. دڵـتەنگی؛ وەڕەزی؛ ئازراوی؛ پەشێوی.

**ملالت بار** / malālatbār/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. خەم‌هێنەر؛ دڵتەنگ‌کەر؛ هۆی دڵتەنگی زۆر.

**ملامت** / malāmat ، ـها/: [عربی]/اسم. لۆمە؛ تانـە؛ سەرکۆنە ‹بعد مرا ملامت مـی‌کنـی کـه چـرا نگفتـی: دواجار لومەم دەکەی کە بۆچ نەتگوت›.

**ملامین** / melāmîn/: [فرانسوی]/اسـم. مـەلامین؛ میلامین؛ ناوی جۆرێک پلاستیکی گەرماسەخت کە دەفر و کەل‌وپەلی ناوماڵ و پیشەسـازی لـێ دروست دەکەن.

**ملانصرالدین** / mollānasreddîn/: [از عربی]/اسم. مەلانەسـرەدین؛ مەلانەسـرەدین؛ کەسـایەتی حەنەک‌وێژ و پێکەنینی نێو چیرۆکان.

**ملانقطـی** / mollānoqatî ، ـهـا/: [از عربـی]/اسـم. [گفتاری] ڕواڵەت‌بین؛ ئەو کەسەی گرینگی زۆرتر دەدا بە ڕێنـووس و ڕواڵـەتی وشـە تـا کاکڵـە و ماناکەی.

**ملانکـــولی** / melānkolî/: [فرانســوی]/اســم. [روان‌شناسـی] ئەسـپەک؛ ماخولیـا؛ میلانخـۆلی؛ ماخۆلان؛ نەخۆشـی ماتـەمینی وێـڕای تـرس و خەفەت.

**ملانـین** / melānîn/: [فرانسـوی]/اسـم. مـیلانین؛ ڕەنگدانەی ڕەش یان کەمکۆڵی تۆخ کە لـە قـژ، پێست و پەردەی چاودا هەیە.

**ملایزقـــل** / mollāyazqal/: [از عربـی/ ؟]/اسـم. ۱. جوو؛ جوولەکە؛ مووسایی ۲. ڕژد؛ چکـووس؛ دەس‌قووجاو.

**ملایک** / malāyek/: [عربی] جمعِ ☜ **ملائکه**

**ملایم** / molāyem/: [عربی] صفت. نەرم؛ هێـواش؛ هووک؛ هـۆک؛ ئـارام؛ هێـدی؛ هێـدیکا؛ شـێنە؛ بێ‌توندی، سـەختی یـان تـەوژم ‹صدای ملایـم: دەنگی نەرم›.

▣ ملایم طبع: نەرم و نیان.

**ملایمت** / molāyemat/: [عربـی]/اسـم. نـەرمـی: ۱. ئـارامی؛ هێـدیکایی؛ سـەوری؛ شـێنەیی ‹با ملایمت دستی بر سر بچه کشید: بە ئارامی دەسـتێکی بە سەر منداڵەکەدا هێنا› ۲. /ـهـا/ نـەرم و نیـانی؛ لەسەرخۆیی ‹اگر ملایمت نشان بدهی کسی حرفت را گوش نمی‌کند: ئەگەر نەرمونیانی بنـوێنی کـەس بـە

قسمت ناکا› ۳. دلۆڤانی؛ میهرەبانی.

**ملبس** / molabbas/: [عربی] *صفت.* بە جل‌وبەرگ؛ پۆشەندار؛ بە پۆشەن؛ پۆشراو؛ لیباس لە بەر؛ جل‌وبەرگ لە بەر ‹ ملبس بە لباس روحانیت: بە جل‌وبەرگی مەلایی›.

**ملبوس** / malbûs، ـات/: [عربی]/*اسم.* پۆشەن؛ پۆشاک؛ جل؛ بەرگ؛ لیباس؛ گنج؛ هنجگ؛ کنج؛ جل‌وبەرگ.

**ملت** / mellat، ـها؛ ملل/: [عربی]/*اسم.* گەل: ۱. نەتەوە؛ گەورەترین کۆمەڵگای مرۆڤ کە لە فەرهەنگ یان مێژوویەکی هاوبەشەوە سەر هەڵدەدەن ۲. جەماوەر؛ کۆمار؛ سەرجەمی کەسانی ولاتێک ۳. *[مجازی]* جەماوەر؛ پسات؛ کۆمرە؛ خەڵک؛ خەڵکی؛ ئاپۆرە؛ حەشامات؛ پڕایی و کۆمای مەردم ‹ملت و دولت: گەل و دەوڵەت› ٤. *[گفتاری]* خەڵکی؛ خەڵک؛ مەردم ‹ملت داشتند نگاه می‌کردند: خەڵکی تەمەشایان دەکرد›.

**ملتحمه** / moltaheme/: [عربی]/*اسم.* لکێنە؛ کاژی ناسک و ڕوونی دیوی ناوەوەی پێڵوو کە سەر گلێنەی چاویش دادەپۆشێ.

**ملتزم** / moltazam، ـان؛ ـین/: [عربی]/*اسم.* پێبەند؛ پابەن؛ دەربەست؛ دەروەن؛ بەڵێندار ‹او را ملتزم کردند از شهر خاج نشود: پێبەندیان کرد لە شار نەچێتە دەر›.

**ملتزم** / moltazem، ـان؛ ـین/: [عربی]/*اسم.* هاوڕێ؛ هامڕا (زۆرتر لەگەڵ ناوداراندا) ‹او هم ملتزم رکاب پادشاه بود: ئەویش هاوڕێی شا بوو›.

▣ **ملتزم رکاب:** هاوڕێ؛ هامڕا؛ کەسێ کە وێڕای کەسایەتیەک سەفەر دەکا.

**ملتفت** / moltafet/: [عربی]/*صفت.* تێگەیشتوو؛ هاگا؛ ئاگا ‹آخر هم ملتفت نشد چه می‌گویم: ئاخریش تێنەگەیشت چی دەڵێم›.

**ملتهب** / moltaheb/: [عربی] *صفت.* ۱. هەڵایساو؛ هەڵمساو؛ پەنەماو؛ هەڵماسیو؛ ئاوساو؛ هەوکردوو ‹گلویم کمی ملتهب است: قوڕگم تۆزێ هەڵایساوە› ۲. *[مجازی]* هەڵگرساو؛ هەڵگڕاو؛ گڕگرتوو؛ گڕگرتی ‹با حالتی ملتهب خودش را به من رساند: بە هەڵگرساوی خۆی پێ گەیاندم›.

**ملجأ** / malca'، ـها/: [عربی]/*اسم.* پەناگا؛ پەناوا؛ سامە؛ پەنا؛ لیز؛ لیزگە؛ چراخ؛ چەپاڵە؛ حەشارگە؛ پەنامگە؛ داڵدە؛ هەڤانگە؛ جێ پەنا؛ پەسارگە؛ جێحەوانەوە.

**ملچ ـ مولوچ** / malačmûlûč, -molûč/: *صوت.* ۱. مەڵچەمەڵچ؛ ملچەملچ؛ دەنگی لێکدانی زمان و مەلاشوو ۲. ماچ و مووچ.

**ملح** / melh، املاح/: [عربی]/*اسم.* خوێ؛ خوا؛ مەکی؛ نمەک.

**ملحد** / molhed، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.* ۱. خوانەناس؛ خودانەژناس ۲. بێدین؛ لامەزەب.

**ملحفه** / malhafe/: [عربی] ☜ **ملافه**

**ملحق** / molhaq(q)/: [عربی] *صفت.* پێوەست؛ پاشکۆ؛ لکاو بە دیتریەوە.

▣ **ملحق شدن:** وێڕا کەوتن؛ یەک گرتن؛ یەک گرتنەوە؛ پێ وەگێرتەی؛ کەوتنە یەک؛ وێکهاتن؛ پێکهاتن ‹رفت و بە دوستانش ملحق شد: ڕۆیشت و وێڕای هاوالانی کەوت›. هەروەها: **ملحق کردن**

**ملحقات** / molhaqqāt/: [عربی]/*اسم.* پاشکۆوان؛ پەیویستگەل.

**ملخ** / malax، ـها/: *اسم.* ۱. کوللە؛ کولۆ؛ کلۆ؛ کولە؛ کللۆ؛ کوللۆ؛ کولی؛ کولەهـ؛ کوسک؛ کووسک؛ مەلەکوڕ؛ مەلە؛ ملۆ؛ مەلیە؛ مێروویەکی باریکی سەر و چاو گەورەی شاخەک کورت بە دوو جووت باڵ و دوو پێی درێژەوە کە پێی هەڵدەبەزێ ۲. ☜ **پروانه ـ۳**

▣ **ملخ بالدار:** کولەی باڵدار؛ جۆرێ کولە کە نەخۆشی تاعوونی لێ دەبێتەوە.

**ملخ بی‌بال:** کوللەی بێباڵ؛ جۆرێ کوللە کە

ئافەتی خەلەیە.

**ملخ پابلند:** سیسرە؛ سیسرک؛ شێرشێرە؛ زیرزیرە؛ مەشکەدڕ؛ جۆرێ کولەی کەسکی باڵتەسکە بە شاخەکی بەرز و لاقی درێژەوە بۆ بازدان، کە پتر شەوانە دەکەوێتە جوولە و نێرەکەی بە شەو سیرەی دێ.

**ملزم** / molzam/: [عربی] *صفت.* ناچار؛ مەجبوور؛ ناعیلاج؛ لەسەرکراو ‹متخلف ملزم بە پرداخت خسارت شد: هەڵەکار ناچار کرا تاوان بدا›.

**ملزوم** / malzûm ، ـات/: [عربی] *صفت.* پێداویست؛ پێکهێنەری ویست ‹نویسندە و قلم لازم و ملزوم هستند: نووسەر و پێنووس پێویست و پێداویستن›.

**ملزومات** / malzûmāt/: [عربی] *اسم.* پێداویستی؛ ئەو شتانەی بۆ بەڕێوە چوونی کارێک پێویستن.

**ملس** / malas/: *صفت. [گفتاری]* مزر؛ مەلەس؛ مێخۆش؛ مەیخۆش: ١. ترش و شیرین پێکەوە ٢. خۆش؛ دڵخواز؛ بەردڵ.

**ملسی** / malasî/: *اسم.* مزری؛ مەلەسی؛ مێخۆشی؛ مەیخۆشی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی مزر بوون ٢. تامی نێوان ترشی و شیرینی.

**ملعبه** / mal'abe/: [عربی] *اسم. [ادبی]* گەپجاڕ؛ گەمە؛ کایە ‹نمی‌خواهم ملعبەی دست این و آن بشوی: نامەوێ ببیتە گەپجاڕی خەڵک›.

**ملعقه** / mal'aqe/: [عربی] ☜ **ملاقه**

**ملعون** / mal'ûn ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* تووکلێکراو؛ نفرەلێکراو؛ مەلعوون ‹آن مرد ملعون می‌خواست شما را فریب بدهد: ئەو پیاوە تووکلێکراوە دەیهەویست فریوتان بدا›.

**ملغمه** / malqame/: [عربی] *اسم.* مەڵغەمە؛ ئالیاژی جیوە و کانزایەکی تر کە دەکرێ ڕەق یان نەرم بێ: **ملقمه**

▣ **ملغمه‌ی طلا:** مەڵغەمەی زێڕ؛ زێڕی سروشتی بە ٦٠٪ جیوەوە.

▣ **ملغمه کردن:** مەڵغەمەکردن؛ پێکهێنانی ئالیاژی کانزایەک لەگەڵ جیوەدا.

**ملغی** / molqā/: [عربی] *صفت.* هەڵوەشاوە؛ بەتاڵ؛ بەتاڵ کراو؛ بەتاڵەوکراو؛ بەتاڵەوبووگ ‹قرارداد ملغی: بەڵێنی هەڵوەشاوە›.

**ملفوظ** / malfûz/: [عربی] *صفت.* بێژراو؛ بێژەکراو؛ دەربڕاو.

**ملقب** / molaqqab/: [عربی] *صفت.* ناسراو ‹سید محمد امین شیخ‌السلامی مکری ملقب به هیمن: سەید محەمەد ئەمین شێخەلیسلامی موکری ناسراو بە هێمن›.

**ملقلق** / molaqlaq/: [عربی] *صفت.* تەقوڕەق؛ بە گرێ و گۆڵ؛ دژوار ‹یک مشت کلمات ملقلق سرهم کردە: بڕێک وشەی تەقوڕەقی ڕیز کردووە›.

**ملقمه** / malqame/: [عربی] ☜ **ملغمه**

**ملک** / malek ، ملوک/: [عربی] *اسم. [ادبی]* مەلیک؛ پادشا؛ پاشا؛ پاڵشا.

**ملک** / melk ، ـها؛ املاک/: [عربی] *اسم.* ملک: ١. زەمینی تایبەتی (وەک مەزرا، باخ یان ماڵ) ‹بیش از صد هکتار ملک داشت: زۆرتر لە سەد هیکتار ملکی هەبوو› ٢. *[حقوق]* ئەوەی خاوەنی هەبێ.

▣ **ملک طلق:** ملکی شەش‌دانگ؛ ملکێ کە بە تەواوی هی کەسێک بێ.

**ملک مشاع:** ملکی بەشدار/ هاوبەش؛ ملکێ کە دوو یان چەن خاوەنی هەبێ.

**ملک** / molk ، ـها؛ ممالک/: [عربی] *اسم. [ادبی]* وڵات؛ وەلات؛ مەملەکەت.

**ملکات** / malekāt/: [عربی] جمعِ ☜ **ملکه**

**ملکداری** / melkdārî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* مالکی؛ دۆخی خاوەن بوونی زەوی و بەڕێوە بردنی کار و باری کشتوکاڵ.

**ملکوت** / malakût/: [عربی] *اسم.* جەهانی پەریان؛ دنیای باڵا؛ عالەمی سەروو؛ جیهانی ئاسمانی.

**ملکوتی** / malakûtî/: [عربی] *صفت.* ١. ئاسمانی؛ سەر بە دنیای نەدیار ٢. *[مجازی]* پاک؛ خاوێن؛

بێ‌گەرد.

**ملکول** / molekûl ، ـها/: [فرانسوی]اسم. [شیمی] مولوکوول؛ بچووکترین وردیلەی تەنێکی ساکار یان تێکەڵ، کە هەموو تایبەتمەندیەکانی ئەو تەنەی تێدابێ: **مولکول**

**ملکولی** / molekûlî/: [فرانسوی] صفت. [شیمی] مولوکوولی؛ سەر بە مولوکوول ‹ساختمان ملکولی: پێکهاتەی مولوکوولی›: **مولکولی**

**ملکه** / maleke, malake ، ـها/: [عربی]اسم. ۱. شاهینە؛ شاژن؛ ژنێ کە بۆخۆی شای ولاتێک بێ ‹ملکەی الیزابت: شاهینەی ئەلیزابت› ۲. ژنی شا؛ پاشاژن؛ شابانوو؛ قەڕالیچە ۳. دایکی شا ٤. [جانورشناسی] ماک؛ مەلەکە؛ مێوینەی ئاوس لە کۆمەڵگای مێرووان (وەک هەنگ، مێرووله، مۆریانە) کە گەرا دەخات ٥. لمَلکات/[مجازی] مەلەکە؛ ئەوەی لە بیردا جێ‌دەگرێ و لە بیر ناچێتەوە.

▣ ملکەی زیبایی: شاجوان؛ شاژنی جوانی؛ هەڵبژاردەی جوان لە نێو کیژ و ژنی بەشدار لە کێبەرکێی جوانیدا.

**ملکی** / melkî/: [عربی] صفت. ملکی؛ سەر بە ملک ‹درآمد ملکی: داهاتی ملکی›.

**ملکیت** / melkîyyat/: [عربی]اسم. ملکیەت؛ ملکداری؛ خاوەنداریەتی.

**ملل** / melal/: [عربی] جمعِ ☜ **ملّت**

▣ ملل راقیە: ولاتە پێشکەوتووەکان.

**ملمع** / molamma' ، ـات/: [عربی]اسم. [ادبی] هۆنراوەیێ کە هەر باڵێکی بە زمانێکە (وەک شیعری کوردی و فارسی یان کوردی و عەرەبی).

**ململ** / malmal/: اسم. مەلمەل؛ مەرمەڕشا؛ خامی تەسک و ناسک و هەرە سپی.

**ململوس** / malmûs/: [عربی] صفت. بەرهەست: ۱. هەساندنی؛ ساوانی کراو ۲. [مجازی] دیار؛ بەرچاو؛ هەست پێ‌کراو.

**ملندوغ** / malandûq/: صفت. [گفتاری] سووک و چرووک؛ هەرچی و پەرچی.

**ملنگ** / malang/: صفت. [گفتاری] ۱. سەرمەس؛ سەرخۆش؛ سەرخوەش؛ سەرووەش ۲. گێل؛ گەوج؛ کەم‌ئاوەز.

**ملوان** / malavān ، ـها؛ ـان/: [کردی]اسم. مەلەوان؛ مەلیەوان؛ مەلەڤان؛ مەلوو؛ دەریاوان؛ گەمیەوان؛ ئەو کەسەی لە سەر کەشتی کار دەکا.

**ملوانی**[1] / malavānî/: [کردی]اسم. مەلەوانی؛ دەریاوانی؛ مەلۆنی؛ گەمیەوانی؛ کار و پیشەی مەلەوان.

**ملوانی**[2]: صفت. مەلەوانی؛ دەریاوانی؛ پێوەندیدار یان سەر بە مەلەوان ‹کلاه ملوانی: کڵاوی مەلەوانی›.

**ملوث** / molavvas/: [عربی] صفت. پیس؛ چلکن؛ گەمار؛ پلکن؛ زیرگن؛ چەپەڵ؛ پیسی پێوەتلاو.

**ملودرام** / meloderām ، ـها/: [فرانسوی]اسم. مێلودرام: ۱. بەرهەمی شانۆیی (شانۆنامە، فیلمنامە، شانۆ یان فیلم) وێڕای جرت‌وفرتی (وەک هەڵپەڕکێ، گۆرانی، هەرا، گریان و پێکەنین) زۆرتر لە ڕادەی ئاسایی ۲. [ادبی] داستانێکی پڕخەم و تەم کە ئاخرێکی خۆش بێنێتەوە.

**ملودی** / melodî ، ـها/: [فرانسوی]اسم. [موسیقی] ئاهەنگ؛ نەغمە؛ دوابەدوایی چەند دەنگی مووسیقایی (سازی یان ئاوازی) بە شێوەیەک کە بەشێکی تەواو پێک‌بێنن.

**ملودیکا** / melodîkā ، ـها/: [فرانسوی]اسم. مێلودیکا؛ سازی باژەنی چکۆلە کە وەک ئۆرگ بە قامک دەژەنرێ.

**ملوس** / malûs/: [عربی] صفت. ژیکەلانە؛ ژیکەلە؛ کتکاڵ؛ جوان و ناسک و نواڵ ‹بچەی ملوس: منالی ژیکەلانە›.

**ملوک** / mulûk, molûk/: [عربی] جمعِ ☜ **مَلِک**

**ملوک‌الطوایفی** / mulûkottavayefî, molûk-/:

[عربی]/سم. ده‌ره‌به‌گایه‌تی: ١. ڕژیمی وڵاتێکی به‌ش ـ به‌ش که‌ هه‌ر به‌شێکی سه‌ربه‌خۆیه‌ و قانوونی تایبه‌ت به‌ خۆی هه‌یه‌ ٢. حوکمه‌تی ملهوڕان.

**ملوکانه** / mulûkane, molûkane/: [عربی/فارسی] صفت. شایانه‌؛ شاهانه‌ ‹سفر ملوکانه: سه‌فه‌ری شاهانه›.

**ملول** / malûl/: [عربی] صفت. زگار: ١. دڵته‌نگ؛ دڵگیر؛ دڵمه‌ند؛ دڵپڕ ‹هوای پاییزی آدم را ملول می‌کند: هه‌وای پاییزان مرۆ دڵگیر ده‌کا› ٢. خه‌مبار؛ خه‌مگین؛ خه‌مین ‹از شنیدن این خبر خیلی ملول شد: به‌ بیستنی ئه‌و هه‌واڵه‌ گه‌لێک خه‌مبار بوو›.

**ملولی** / malûlî، ـها/: [عربی]/سم. زگاری: ١. دڵته‌نگی؛ دڵگیری؛ دڵمه‌ندی؛ دڵپڕی؛ دڵپه‌ڕێشانی ٢. خه‌مباری؛ خه‌مینی.

**ملون** / molavvan/: [عربی] صفت. [ادبی] ڕه‌نگاوڕه‌نگ؛ ڕه‌نگین؛ ڕه‌نگامه‌.

**ملهم** / molhem/: [عربی] صفت. [ادبی] سه‌رۆپێکراو؛ سه‌رۆگرتوو؛ گۆواربوو؛ به‌ دڵدا هاتوو ٢. وه‌رگیراو.

**ملی** / mellî/: [عربی] صفت. نه‌ته‌وه‌یی؛ گه‌لی؛ گه‌لێر: ١. سه‌ر به‌ گه‌ل ‹تیم ملی: تیمی نه‌ته‌وه‌یی› ٢. گشتی؛ هه‌موانی ‹بانک ملی: بانکی نه‌ته‌وه‌یی› ٣. [قدیمی] ناده‌وڵه‌تی؛ تایبه‌تی ٤. /ملیون/ گه‌لپه‌رست ‹حکومت ملی: حکوومه‌تی نه‌ته‌وه‌یی›.

▣ **ملی شدن**: بوونه‌ نه‌ته‌وه‌یی: ١. چوونه‌ ژێر ده‌سته‌ڵاتی ده‌وڵه‌ت ٢. بوونه‌ گشتی؛ ناده‌وڵه‌تی بوونه‌وه‌. هه‌روه‌ها: **ملی کردن**

**ملیارد**[1] / melyārd, milyārd، ـها/: [فرانسوی] /سم. ملیارد؛ میلیارد؛ ژماره‌ی سه‌ره‌کی به‌رانبه‌ر به‌ هه‌زار ملیۆن: ($10^9$): **بِلیۆن؛ بیلیون؛ میلیارد**

**ملیارد**[2]: صفت. ملیارد؛ میلیارد: ١. به‌ ئه‌ندازه‌ و چه‌نیه‌تی ملیارده‌وه‌ ٢. له‌ جێگه‌ و پله‌ی ملیارددا: **میلیارد**

**ملیاردر** / melyārder, milyārder، ـها/: [فرانسوی] صفت. [مجازی] ملیاردر؛ یه‌کجار ده‌وڵه‌مه‌ند؛ ده‌وڵه‌مه‌ندی خاوه‌ن یه‌ک یان چه‌ند ملیارد: **میلیاردر**

**ملیاردم** / melyārdom, milyārdom/: [فرانسوی/فارسی] صفت. ملیارده‌م؛ به‌ پله‌، جێگه‌ یان ڕیزی ملیارده‌وه‌: **میلیاردم**

**ملی‌پوش** / mellîpûš، ـها؛ ـان/: [عربی/فارسی] صفت. ئه‌ندامی تیمی نه‌ته‌وه‌یی وڵاتێک.

**ملیت** / mellîyyat/: [عربی]/سم. نه‌ته‌وایه‌تی: ١. بار و دۆخی سه‌ر به‌ نه‌ته‌وه‌یه‌کی تایبه‌ت بوون ٢. بار و دۆخی هه‌بوونی نیشتمانێکی هاوبه‌ش.

**ملیت‌پرستی** / mellîyyatparastî/: [عربی/فارسی] ☜ **ملی‌گرایی**

**ملیح** / malîh/: [عربی] صفت. مه‌کین؛ زه‌ڕه‌دار؛ زه‌ڕه‌شیرین؛ دڵ‌په‌سه‌ند؛ دڵنشین؛ خوێن‌شیرین ‹چهره‌ی ملیح: سیمای مه‌کین›.

**ملی‌گرا** / mellîgerā، ـها؛ ـیان/: [عربی/فارسی] صفت. گه‌لپه‌رست؛ نه‌ته‌وه‌په‌رست؛ نه‌ته‌وه‌خواز؛ گه‌لحه‌ز ‹حزب ملی‌گرا: پارتی گه‌لپه‌رست›.

**ملی‌گرایی** / mellîgerāyî/: [عربی/فارسی]/سم. گه‌لپه‌رستی؛ نه‌ته‌وه‌په‌رستی؛ نه‌ته‌وه‌خوازی؛ گه‌لحه‌زی؛ دڵبه‌سته‌یی و بڕوا به‌ گه‌لی خۆ، به‌تایبه‌ت بڕوا به‌ سه‌رتری گه‌لی خۆ و پێداگری له‌ سه‌ر فه‌رهه‌نگ و قازانجی گه‌ل له‌ به‌رامبه‌ر گه‌لانی تره‌وه‌: **ملیّت‌پرستی**

**ملیله** / malîle، ـها/: /سم. مه‌لیله‌؛ هه‌ودای باریک له‌ کانزا (به‌تایبه‌ت زێڕ، زیو یان کانزای بریقه‌داری دی) که‌ بۆ جوانی به‌ جل‌وبه‌رگیدا ده‌دوورن یان له‌ ده‌فر و که‌رسته‌ی ده‌ده‌ن.

**ملیله دوزی** / malîledûzî/: /سم. مه‌لیله‌دووری: ١. کاری دوورینی نه‌خش و نیگار به‌ مه‌لیله‌ ٢. پارچه‌ی نه‌خشێنراو به‌ مه‌لیله‌.

**ملیله کـاری** / malîlekārî/: /اسم. مه‌لیلـه‌کاری؛ ڕازاندنه‌وه‌ی ده‌فر و که‌ره‌سته‌ی کانزایی بـه تاڵـه هه‌ودای زێڕ، زێو یان پاقر.

**ملـین** / molayyen ، ـهـا/: [عربـی]/اسم. بـروێن؛ ڕه‌وێنه‌ک؛ ڤـژۆکه‌ر؛ ئـه‌و ده‌رمانـه‌ی زک ڕه‌وان ده‌کا.

**ملیـون**[1] / melyûn, milyûn, milyon ، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. ملیۆن؛ میلیۆن؛ ژماره‌ی تـه‌رتیبی به‌رانبه‌ر به هه‌زار هه‌زار یان $10^6$: **میلیون**

**ملیون**[2]: صفت. ملیـۆن؛ میلیـۆن: ۱. بـه ڕێـژه و ئه‌ندازه‌ی ملیۆن ۲. بـه جێگـا، ڕیـز یـان پلـه‌ی ملیۆن * **میلیون**

**ملیون** / mellîyyûn/: [عربی]/اسم. گه‌لپه‌رسـتان؛ نه‌تـه‌وه‌خوازان؛ گه‌لحـه‌زان؛ هـۆگرانی قـازانج و ئامانجه‌کانی گه‌ل.

**ملیونر** / melyûner, milyûner, milyoner ، ـها/: [عربـی] صفت. [مجـازی] ملیـۆنر؛ مایـه‌وه‌ر؛ دارا؛ ساماندار؛ مایه‌بۆش؛ ده‌وڵه‌مه‌ند؛ ده‌وڵـه‌مه‌ن؛ بـه ماڵ و سـامانێک ئه‌وه‌نـده‌ی یـه‌ک یـان چه‌نـد ملیۆن: **میلیونر**

**ملیـونم** / melyûnom, milyonom/: [فرانسـوی/ فارسـی] صفت. ملیـۆنم؛ بـه ڕیـز، ڕزن، پلـه یـان جێگای ملیۆنه‌وه: **میلیونم**

**ملیــــــونی** / melyûnî, milyûnî, milyonî/: [فرانسـوی] صفت. ملیـۆنی؛ بـه ژماره‌یـه‌کی زۆر، ئه‌وه‌نده‌ی یه‌ک ملیۆن یان زۆرتر ‹جمعیت ملیونی: جه‌ماوه‌ری ملیۆنی›: **میلیونی**

**ممــات** / mamāt/: [عربـی]/اسـم. [ادبـی] مـه‌رگ؛ ڕه‌وتی مردن؛ نه‌مان؛ نه‌مه‌نـه‌ی ‹حیـات و ممـات: ژیان و مه‌رگ›.

**ممارســت** / momāresat ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. ڕاهـاتوویی؛ هه‌ڤـۆتی؛ فێره‌کـاری به‌تایبـه‌ت بـه هۆی چه‌ن جاران پێوه ماندوو بوونه‌وه.

⊡ **ممارست یافتن**: ڕاهاتن ‹مدتی که تمـرین بکنـی ممارست خواهی یافت و می‌توانی عهده‌دار کار شـوی: ماوه‌یێ که خه‌ریک بی، ڕادیی و ده‌توانی کـار لـه ئۆده بگری›.

**مماس** / momās/: [عربی] صفت. ۱. ڕێکنووسـاو؛ لێکه‌وته؛ وێک‌که‌وتـه؛ لێـک‌تـه‌قیو ۲. ☜ خـط مماس، **خط**

**مماشات** / momāšāt ، ـها/: [عربی]/اسم. کـار یـان ڕه‌وتی ساچان؛ سازان؛ ڤه‌خوراندن ‹مدتی مماشات کرد تا راه‌حلی پیدا شود: ماوه‌یه‌ک ساچا تا چاره‌یـه‌ک بدۆزێته‌وه›.

**ممالک** / mamālek/: [عربی] ۱. جمع ☜ مَلک ۲. جمع ☜ مَملَکت

**ممانعــت** / momāne'at ، ـهــا/: [عربــی]/اسـم. پێشگری؛ به‌رگری؛ کار یان ڕه‌وتی پـێش‌گـرتن؛ به‌ر لێ/ پێ گرتن.

⊡ **ممانعت شدن**: به‌رگری‌کران؛ پێشـگری‌کـران؛ پێش پێ گیران ‹از ورود او ممانعت شد: له هاتنـه ژووره‌وه‌ی بـه‌رگری کـرا›. هـه‌روه‌ها: **ممانعـت کردن**

**ممتــاز** / momtaz/: [عربــی] صـفت. ۱. هه‌ڤـیاز؛ له‌سه‌ر؛ ژمارده؛ هه‌ڵبژارده؛ بژاره؛ بژارده؛ قوتحـه؛ به چۆنیه‌تیه‌کی سـه‌رتر، باشـتر و بـه‌رچاوتره‌وه ۲. جیاکار؛ جیاواز.

**ممتحن** / momtahen ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. تاقی‌کار؛ تاقی‌که‌ره‌وه؛ ئه‌زموونگر.

**ممتد** / momtad(d)/: [عربی] صفت. بـێ‌برانـه‌وه؛ دوور و درێژ: ۱. درێژخایه‌ن؛ به درێژایی له باری کاته‌وه ‹کف زدن‌های ممتد: چه‌پڵه‌ڕێزانی بێ‌برانه‌وه› ۲. درێژ؛ به درێژایی له باری مه‌وداوه ‹خط ممتـد: هێڵی درێژ›.

**ممتنع** / momtane'/: [عربی] صفت. ۱. بـه‌رخۆگر؛ پارێزکه‌ر ۲. نه‌کردنی؛ نه‌کراو؛ بووزنه‌خۆر.

**ممــــد** / momed(d)/: [عربــی] صــفت. یــاوه‌ر؛ یارمه‌تیده‌ر؛ یاریده‌ر؛ ئاریکار.

**ممـدوح** / mamdûh ، ـان؛ ـین/: [عربـی] صفت. په‌سن‌دراو؛ په‌سندکراو ‹این عمـل ممـدوح همگـان

است: ئەم کارە پەسندراوی هەمووانە›.

**ممر** / mamar(r)/: [عربی]/اسم. ڕێ؛ ڕا؛ ڕێگە؛ ڕاگە؛ بوار؛ بگار.

▣ **ممر معاش**: بواری ژین؛ ڕێگەی بەڕێوە بردنی ژیان.

**ممزوج** / mamzûc/: [عربی] صفت. [ادبی] تێکەڵ؛ تێکەڵاو؛ تێکدراو؛ کەرچلی؛ ئامێتە؛ ئاوێتە؛ تەڤلهەف؛ لێکدراو؛ تێکەڵکراو؛ تێکهەڵشێلدراو.

**ممسک** / momsek ، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. [ادبی] ڕژد؛ چکووس؛ چکود؛ لەچەر؛ بزگیر؛ نانکوور.

**ممکن** / momken/: [عربی] صفت. کردنی؛ ڕەوتی بۆبوون: ۱. گونجاو؛ ئەوەی هەڵگرێ، بۆی ببێ و لە کردن بێت ۲. /ات/ ڕێکەوت؛ هەڵکەوت؛ ڕەخساو؛ ڕەخسیو؛ ڕوودانێک بە پێی سروشت، عادەت یان دابونەریت ۳. بووزخۆر؛ لواو؛ بە دۆخی ئەوەی بۆی هەیە ڕوو بدا یا نەدات ٤. بووزخۆر؛ بە دۆخی ئەوەی دەکرێ دروست یا نادروست بێ.

**ممکنات** / momkenāt/: [عربی]/اسم. کردنیگەل؛ بووزخۆرگەل؛ ئەو کارانەی بۆیان هەیە بکرێن: بەرانبەر: **محالات**

**مملکت** / mamlekat, mamlakat ، ـها؛ ممالک/: [عربی]/اسم. ۱. وڵات؛ وەلات؛ مەملەکەت ‹مملکت چین: وڵاتی چین› ۲. بەر و بووم؛ سەرزەوی ‹مملکت خُراسان: بەر و بوومی خوراسان›.

**مملکتی** / mamlekatî, mamlakatî/: [عربی] صفت. وڵاتی؛ مەملەکەتی ‹مقامهای مملکتی؛ امور مملکتی: پایەدارانی وڵاتی؛ کاروباری مەملەکەتی›.

**مملو** / mamlow, mamlo:, mamlov/: [عربی] صفت. تژی؛ پڕ؛ پڕاوپڕ؛ لێوانپڕ؛ لێوانلێو؛ دارماڵ؛ پەڕ؛ سەرڕێژە؛ لیوانە ‹دلها مملو از شادی بود: دڵان تژی لە شادی بوون›.

**ممنوع** / mamnû'/: [عربی] صفت. قاخە؛ قەدەغە؛ یاساخ؛ بەرگیراو؛ ڕێ(پێ)نەدراو ‹سیگار کشیدن ممنوع است: جگەرە کێشان قەدەغەیە›.

▣ **ممنوع کردن**: ڕێ (پێ) نەدان؛ هەماندن؛ کردنە پاوان؛ قەدەغەکردن. هەروەها: **ممنوع بودن؛ ممنوع شدن**

**ممنوع‌الانتشار** / mamnû'ol'entešār/: [عربی] صفت. بەبێ مافی چاپ و بلاو بوونەوە.

**ممنوع‌الخروج** / mamnû'olxurûc, mamnû'xorûc/: [عربی] صفت. بەبێ مافی چوونە دەر لە شوێنێک.

**ممنوع‌القلم** / mamnû'olqalam/: [عربی/ معرب] صفت. بەبێ مافی نووسینی بەرهەمێک بۆ بلاو بوونەوە.

**ممنوع‌الملاقات** / mamnû'olmolāqāt/: [عربی] صفت. بەبێ مافی چاو پێکەوتن و دیداری خەڵک، بەتایبەتی کەس و کاری نزیک.

**ممنوع‌الورود** / mamnû'olvurûd, -vorûd/: [عربی] صفت. بەبێ مافی چوونە ناوەوە.

**ممنوعه** / mamnû'e/: [عربی] صفت. بەرگیراو؛ بەر پێگیراو؛ قەدەغەکراو ‹کالای ممنوعه: کالای بەرگیراو›.

**ممنوعیت** / mamnû'îyyat ، ـها/: [عربی]/اسم. بەرگیراوی؛ قەدەغەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی قەدەغە بوون ‹ممنوعیت تردد: بەرگیراوی هاتوچۆ›.

**ممنون** / mamnûn/: [عربی] صفت. شوکرانەبژێر؛ سپاسگوزار؛ سپاسوێژ؛ سپاسکەر؛ منەتبار؛ منەتکار؛ بەر منەت؛ مەمنوون؛ چاکە لە سەر ‹همیشه ممنون شما خواهد بود: هەمیشە شوکرانەبژێرتان دەبێ›. هەروەها: **ممنون بودن؛ ممنون ساختن؛ ممنون شدن؛ ممنون کردن**

**ممه** / mame ، ـها/: اسم. ۱. [کودکانه] مەمە؛ مەم؛ مەمڵ؛ مەمێ؛ مەمکە؛ مەمک ۲. [کودکانه] مەمکەمژ؛ مەملە؛ مۆستک؛ مەمکەمژە ۳. [مجازی] شیر؛ شۆت.

◘ ممه را لولو بردن: *[تعریض]* مەمکە سەگ خواردن؛ دووکان هەڵچنیان؛ هەل لە کیس چوون ‹آن ممه را لولو برد، بعد از این فقط در برابر کار می‌توانی پول بگیری: ئەو مەمکە سەگ خواردی، لەمە بەدوا تەنیا لە بەرامبەر کارەوە پووڵ دەگری›.

**ممهور** / mamhûr/: از مُهر به سیاق اسم مفعول عربی] *صفت*. مۆرکراو.

**ممیز** / momayyez، ـها/: [عربی]/*اسم*. ۱. مومەیز؛ نیشانەی «/» کە دووبەشی ژمارە لەیەک جیا دەکاتەوە (وەک لە نێوان ۲ و ۵ لە ۲/۵ دا) ۲. /ـان؛ ـین/ بەراوردکار؛ هەڵسەنگێنەر؛ نرخێنەر؛ نرخبڕ ‹ممیز مالیاتی: بەراوردکاری پیتاک› ۳. سانسۆرچی.

◘ ممیز مالیاتی: بەراوردکاری پیتاک؛ ئەو کەسە ئەندازەی پیتاک دەسنیشان دەکا.

**ممیزی** / momayyezî، ـها/: [عربی]/*اسم*. بەراورد؛ هەڵسەنگێنی؛ کار و ڕەوتی نرخ بڕین؛ هەڵسەنگاندن؛ نرخاندن.

**من**[1] / man/: *اسم*. ۱. مەن؛ منە؛ کێشێکی کۆنی ئێرانی ۲. *[روان‌شناسی]* بەشێک لە سێ بەشی دەروون لە دۆزی دەروونکۆڵیدا (ئەوانی تر «اَبرمَن» و «نهاد»).

◘ من تبریز: مەنی تەبریز؛ کێشێکی کۆنە بەرامبەر بە پێنج کیلۆ.

من ری: مەنی ڕەی؛ کێشێکی کۆن بەرانبەر بە دوازدە کیلۆ.

من شاه: مەن؛ کێشێکی کۆنە بەرامبەر بە سێ کیلۆ.

**مـن**[2]: ضمیر. ئەمن؛ مە؛ ئەم؛ مـن؛ ئەز؛ مـو؛ جێناوی تاکی ویژەر.

**منابر** / manāber/: [عربی] جمعِ ☜ **مَنبَر**

**منابع** / manābe'/: [عربی] جمعِ ☜ **منبع**

◘ منابع انسانی: هێزی مرۆڤی.

منابع طبیعی: سەرچاوەی سروشتی؛ ئەو سامانەی سروشت داویە (وەکانگا، دارستان، کانی و ...).

منابع مالی: سەرچاوەی ماڵی؛ ڕێوشوێنی پووڵ دەرهێنان.

**مناجات** / monācāt، ـها/: [عربی]/*اسم*. نزا؛ سەلا؛ مناجات؛ ڕاز و نیاز؛ کازکاز: ۱. کاری لالانەوە لە خودا و سپاس و پێزانینی خۆ دەربڕین ۲. ئەو شیعر و دۆعایانەی بەم مەبەستەوە دەگوترێ.

**منادا** / monādā/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* بانگ کراو؛ خووەندی؛ بەربانگەواز؛ قاولێ‌کریاگ.

**منادی** / monādî، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم*. بانگ‌ڕایەڵ؛ بانگکەر؛ جارچی؛ ڕاگەیێن؛ قاوکەر؛ بانگەوازکەر؛ کەرەلیاس؛ کەسێ وا بە دەنگی بەرز خەبەر و باسێک بە هەمووان ڕادەگەیێنێ.

**منار** / menār، ـها/: [عربی]/*اسم*. *[گفتاری]* منارە؛ مەنارە؛ بینایەک گرۆڤەری هەڵچوو وەکوو بەشێک لە مزگەوتان بۆ بانگ لە سەر دان.

**مناره** / menāre، ـها/: [عربی]/*اسم*. منارە.

**منازع** / monāze'، ـان/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* شەڕکەر؛ دژمن؛ نەیار.

**منازعات** / monāze'āt/: [عربی] جمعِ ☜ **منازعه**

**منازعه** / monāze'e، ـها؛ منازعات/: [عربی]/*اسم*. داوا؛ شەڕ و هەرا.

**منازل** / manāzel/: [عربی] جمعِ ☜ **منزل**

**مناسب** / monāseb/: [عربی] *صفت*. لەبار: ۱. شیاو؛ هاولە؛ لەجێ؛ بەجێ؛ هەموار؛ لەباو؛ دەرخۆر؛ کێس؛ ژێهاتی؛ گونجاو ‹کار مناسب: کاری شیاو› ۲. ڕێک؛ هاوڕێژە ‹قد و قامت مناسب: بەژن و بالای ڕێک›.

**مناسبات** / monāsebāt/: [عربی]/*اسم*. بۆنەگەل؛ پەیوەندی نێوان چەن شت.

**مناسبت** / monāsebat، ـها/: [عربی]/*اسم*. ۱. لەباری؛ لێک‌ڕێکی؛ هاوڕێژەیی ۲. بۆنە؛ هۆ ‹به مناسبت برگشت شما: بە بۆنەی هاتنەوەی ئێوە› ۳. بۆنە؛ کاتی سەر بە ڕووداوێکی گرینگ یان تایبەت ‹آنها در مناسبتهای مختلف همدیگر را

می‌بینند: ئەوان لە بۆنەگەلی جۆراوجۆردا یەکتر دەبینن›.

**مناسک/** manāsek/: [عربی]/اسم. ۱. ڕێوڕەسمی ئایینە دینیەکان ۲. *[فقه]* ڕێوڕەسمی حەج.

▣ **مناسک حج:** ڕێوڕەسمی حەج.

**مناصب** / manāseb/: [عربی] جمعِ ☜ **منصب**

**مناصفه** / monāsefe/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کاری کردنە دوو لەت؛ دوو کوت‌کردن؛ دوو نیوکردن.

**مناطق** / manāteq/: [عربی] جمعِ ☜ **منطقه**

**مناظر** / manāzer/: [عربی] جمعِ ☜ **منظره**

**مناظرات** / monāzerāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مناظره**

**مناظر و مرایا** / manāzer-o-marāyā/: [عربی] /اسم. دیمانە؛ پرسپیکتیڤ؛ وێنەی سێ بەری هەر شتێک دە سەر پەڕی کاغەزدا.

**مناظره** / monāzere ، ـها؛ مناظرات/: [عربی]/اسم. قسەملانێ؛ بەربەرەکانێی نێوان بڕوادارانی جۆراوجۆر بۆ دەربڕین و سەلماندنی بیر و ڕای خۆیان؛ کاری ڕابەزاندن.

**مناعت** / manā'at/: [عربی]/اسم. ۱. بەرزی؛ بلندی؛ بلیندی ۲. ـها/ بەرزەمژی.

▣ **مناعت طبع:** بەرزەمژی؛ دلڤەرایی؛ جامێری؛ جوامێری؛ بایەخ نەدان بە پووڵ و پارە.

**منافات** / monāfāt/: [عربی]/اسم. ناسازگاری؛ ناتەبایی.

**منافذ** / manāfez/: [عربی] جمعِ ☜ **منفذ**

**منافع** / manāfe'/: [عربی] جمعِ ☜ **منفعت**

**منافق** / monāfeq ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. دووڕوو؛ ڕووبین؛ ناڕاست؛ دوڕاز؛ دووقوون؛ قەفراخ؛ فرەڕو؛ حەفتڕەنگ؛ دووسەر؛ دوپڵ؛ هوکارە و هۆگری دووڕوویی.

**منافقی** / monāfeqî/: [عربی]/اسم. دوڕازی؛ دووڕوویی؛ ناڕاستی؛ دووسەری؛ حەفتڕەنگی؛ بە ڕواڵەت لایەنگری‌کردن لە کەس یان بیرێ کە لە دڵەوە نەیار و دژمنی بێ.

**منافی** / monāfî/: [عربی] صفت. ۱. حاشالێکەر ۲. دژ؛ ناتەبا؛ ناکۆک.

▣ **منافی عفت:** ناتەبا لەگەڵ داوێن‌پاکی.

**مناقب** / manāqeb/: [عربی] جمعِ ☜ **منقبَت**

**مناقشات** / monāqešat/: [عربی] جمعِ ☜ **مناقشه**

**مناقشه** / monāqeše ، ـها؛ مناقشات/: [عربی]/اسم. گیرە و کێشە؛ کێشە؛ سواژ؛ مشت و مڕ ‹مدتی بر سر میراث مناقشه بود: ماوەیەک لە سەر بەشە میرات گیرە و کێشە بوو›.

**مناقصات** / monāqesāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مناقصه**

**مناقصه** / monāqese ، ـها؛ مناقصات/: [عربی]/اسم. کێ‌کەمتر؛ جۆرێ کڕین کە فرۆشیاران بانگهێشتن دەکرێن کێهەیان هەرزانتری بدا، لەوی دەستێنن.

**منال/** menāl/: [از عربی]/اسم. *[نامتداول]* شوێنی داهات ☜ **مال‌ومنال**

**من‌باب** / membābe, menbābe/: [عربی] حرف. بۆ؛ بوو؛ لەبۆ؛ پەی؛ ئەڕای.

▣ **من‌باب مثال:** بۆ وێنە ‹من باب مثال دخترعمویت را در نظر بگیر: بۆ وێنە دوت‌مامت بێنە بەرچاو›.

**منبت** / monabbat/: [عربی]/اسم. مونەبەت؛ بەرهەمی دارینەی (وەک مێز، سنۆق و...) ڕازاوە بە نەخش و نیگاری هەڵکۆڵراو لە دار.

**منبت‌کار** / monabbatkār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. مونەبەتکار؛ ڕازێنەری چێو.

**منبت‌کاری** / monabbatkārî/: [عربی/ فارسی] /اسم. مونەبەتکاری: ۱. هونەری تاشین و هەڵکۆڵینی چێو و دەرهێنانی نەخشی زۆپ لە سەری ۲. پیشەی مونەبەتکار ۳. ـها/ کارگەی مونەبەتکار ٤. *[گفتاری]* بەرهەمی ئەو کارە.

**منبر** / mambar, membar, manbar ، ـها؛ منابر/: [عربی]/اسم. ۱. دوانگە؛ نیەر؛ مینبەر؛ شوێنی بەرز بۆ وتار دان و مۆچیاری‌کردن ۲. مێز یان سەکۆی

نانەوایی بۆ نان لە سەر هەڵخستن.
◘ **بالای/ به منبر رفتن:** *[کنایی]* چوونە سەر مینبەر؛ کردنە بان مینبەرا: ١. ئامۆژیاری دان؛ نەسیحەتکردن؛ پەند دان ٢. فرەویژی کردن؛ قسە تووڕ دان.

**منبسط** / mombaset, monbaset /: [عربی] *صفت.* فش؛ فۆڵ؛ فرت؛ کراوە؛ کێشهاتوو. بەرانبەر: **منقبض** ‹هر جسمی در گرما منبسط می‌شود و حجمش افزایش می‌یابد: هەموو شتێ لە گەرمادا فش دەبێ و قەبارەی زۆر دەکا›.

**منبع** / mamba', manba' /، ـها؛ منابع/: [عربی] *اسم.* ١. سەرچاوە؛ بناوان؛ چاوگە؛ سەرچەمە؛ سەرچاوکە؛ سەرچاوگە؛ چاوگ؛ ژێدەر؛ شوێنی سەرهەڵدان و دۆزینەوەی شتێک ‹منبع آلودگی: سەرچاوەی پیسی› ٢. چاوگ؛ چاوگە؛ ژێدەر؛ سەرچاوە؛ سەرچاوکە؛ سەرچاوگە؛ کەس یا نووسراوەیێ کە زانیاری بە دەستەوە دەدات ‹منبع خبر: سەرچاوەی هەواڵ› ٣. خەزێنە؛ دەفری تراو هەڵگرتن ‹منبع نفت: خەزینەی نەوت›.

**منبعث** / momba'es, monba'es /: [عربی] *صفت.* سەرچاوەگرتوو؛ هەڵستاو؛ هەڵساو؛ هەڵهاتوو ‹نیروی دولت از ملت منبعث است: هێزی دەوڵەت لە گەلەوە سەرچاوەی گرتووە›.

**مِن‌بعد** / memba'd, menba'd /: [عربی] *قید.* لەمەولا؛ لەمەودوا؛ لەمە بە دواوە؛ لە شوێن ئەمە؛ لەمەولاوە؛ ئیساولا؛ ئیسەولا؛ ئیسە و دما؛ چیەودما؛ ئیسە و چەولا؛ چیەولا ‹من‌بعد باید زودتر بیایی: لەمەولا دەبێ زووتر بی›.

**منت** / mennat /: [عربی] *اسم.* چکی؛ منەت؛ منەتە؛ منە: ١. منەتباری ‹منت داشتن: منەتبار بوون› ٢. چاکە؛ خاسی؛ پیاوەتی ‹منت گذاشتن: چاکە کردن›.

◘ **منت داشتن:** منەتبار بوون ‹اگر این کار بشود منت داریم: ئەگەر ئەم کارە بکرێ، منەتبارین›.

**منت سر کسی گذاشتن:** منەت نانە سەر کەسێ؛ کەسێ منەتبارکردن؛ چاکە و خزمەت بەچاودا دانەوە ‹برای این ماشین قراضه چقدر سر ما منت گذاشتی: بۆ ئەم ماشێنە داشقە، چەندەت منەت نایە سەرمان›.

**منت کشیدن:** منەتکێشان؛ منەتکێشتەی؛ داوا کردنی شتێ لە کەسێک بە نابەدڵی و لە سەر ناچاری وێڕای بەخۆدا شکانەوە و سووک بوون ‹برای این یک لقمه نان مجبورم منت این و آن را بکشم: بۆ ئەم پاروە نانە ناچارم منەتی کەس و ناکەس بکێشم›.

**منت گذاشتن:** منەت نان/ نیان؛ منەت نیەی؛ چاکە و باشی لەرادەبەدەرکردن ‹بر ما منت گذاشتند و تشریف آوردند: منەتیان نایە سەرمان و تەشریفیان هێنا›.

**منتج** / montac(c) /: [عربی] *صفت.* وەرگیراو؛ بەرهەمهاتوو.

**منتجه** / montacce /: [عربی] *اسم.* *[فیزیک]* ئاکام؛ ئەنجام؛ بەرهات.

**منتخب** / montaxab /: [عربی] *صفت.* ١. ـان/ ـات/ هەڵبژێردراو ‹نمایندەی منتخب: نوێنەری هەڵبژێردراو› ٢. ـها؛ ـان؛ ـین/ هەڵبژاردە ‹اشعار منتخب: هۆنراوەگەلی هەڵبژاردە›.

**منتدار** / mennatdār /: [عربی/ فارسی] *صفت.* شوکرانەبژێر؛ پێزان؛ سپاسگوزار؛ منەتدار ‹همیشه منتدار شما خواهم بود: هەمیشە شوکرانەبژێرتان دەبم›.

**منتر** / mantar /: *اسم.* ١. *[نامتداول]* ئەفسوونێک بۆ کەویکردنی جڕ و جانەوەر ٢. *[گفتاری]* گەپچاڕ؛ دارەدەس؛ ئەو کەسەی دەسەڵاتی لە خۆی نیە و دەبێتە داردەستی ئەم و ئەو.
هەروەها: **منتر شدن؛ منتر کردن**

**منتسب** / montasab, montaseb /، ـها/: [عربی] *صفت.* ١. لێدراو؛ وەپاڵدراو ‹اتهام منتسب واهی است: ئەو بوختانە لیدراوە، پڕوپووچە› ٢. ـان؛ ـین/ سەر بە؛ هاوگەر؛ بەستە ‹از چریکهای منتسب حزب

بود: لەو چریکە سەر بە حیزبەکان بوو›.

**منتش** / mantaš ، ـها/: [؟]/اسم. تەوەق؛ ئاڵقەی کانزایی دەوری چەرخ (گاری، فاتیوون و...) کە تەگەرەی تێدەچێ.

**منتشا**/ mantaša ، ـها/:/اسم. [ادبی] متەشا؛ مەنتەشا؛ مەنتەشە؛ داردەستی گرێدار و ئەستووری دەستی دەورێشان.

**منتشر** / montašer/: صفت. بلاوکراو؛ بلاوبوو؛ بلاوەبوو؛ پەخش‌بوو؛ پەخشەوەبوو.

▣ منتشر شدن: بلاو بوونەوە؛ پەخش بوونەوە: ۱. پرش و پەلا بوون ‹این خبر در همه جا منتشر شد: ئەم هەواڵە لە هەموو شوێنێکدا بلاو بووەوە› ۲. دەرچوون؛ لە چاپ دران؛ چوونە چاپ ‹سالی چهار شماره منتشر می‌شود: ساڵێک چوار ژمارەی لێ بلاو دەبێتەوە›. هەروەها: **منتشر کردن**

**منتظر** / montazer ، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. چاوەڕوان؛ چاوەنوار؛ چاوەنۆڕ؛ چاوەنێر؛ چاڤنێر؛ چەشدار؛ چاوەڕێ؛ چەمەڕا؛ چەشرێ؛ بەتەما؛ تەمادار.

▣ منتظر خدمت: بە تەمای کار؛ کارمەند یان کارگێڕێکی دامەزراوەیێ کە بە بۆنەیەکەوە بۆ ماوەیەک وەلانراوە و چاوەڕوانە بانگی بکەنەوە سەر کارەکەی.

▣ منتظر بودن: چاوەڕوان بوون؛ چاوەڕێ بوون؛ چاوەنۆڕ بوون؛ چاوەنوار بوون؛ چەمەڕا بیەی؛ بە تەما بوون؛ تەمادار بوون ‹منتظر پدرش بود: چاوەڕوانی باوکی بوو›. هەروەها: **منتظر شدن؛ منتظر گذاشتن؛ منتظر ماندن**

**منتظم** / montazam/: [عربی] صفت. ڕێک وپێک؛ لەبار و تەرز.

**منتفع** / montafe' ، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. بەهرەمەند؛ بەهرەبەر؛ بەهرەوەرگر.

**منتفی** / montafî/: [عربی] صفت. نەلێکراو؛ هەڵوەشاوە.

▣ منتفی بودن: بەتاڵ بوون؛ پێک نەهاتن؛ سەر نەگرتن ‹احتمال کودتا منتفی است: شیمانەی کودەتا بەتاڵە›.

منتفی شدن: هەڵوەشانەوە ‹سفر سلیمانیه منتفی شد: سەفەری سلێمانی هەڵوەشایەوە›.

**منتقد** / montaqed ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. ڕەخنەگر: ۱. ئەو کەسە لە بەرهەمێکی هونەری ورد دەبێتەوە و هەڵیدەسەنگێنێ ۲. پەڵپگر؛ ئەو کەسەی عەیب لە کەس، شت یان شوێنێک دەگرێ.

**منتقل** / montaqel/: [عربی] صفت. گوێزراوە؛ ڕاگوێزراوە؛ گواستراوە؛ ئەوەوارپیا.

▣ منتقل شدن: گوێزرانەوە؛ گۆزرانەوە؛ ئەوەوارپەی؛ وارپایوە؛ لە شوێنێ بۆ شوێنێ بران یان ناردران.

منتقل کردن: ۱. بردن؛ ناردن؛ کەسێ یان شتێ لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر گواستنەوە ‹وسایل را به خانه‌ی جدید منتقل کردم: کەلوپەلەکەم بردە ماڵی تازەوە› ۲. فێرکردن؛ دان یان سپاردنی زانست یان ئاگادارییەک بە کەس یان تاقمێ ۳. گواستنەوە؛ گۆزینەوە؛ گۆڕینی شوێنی کاری کارمەند لە شارێکەوە بۆ شارێکی‌تر ‹ما را به قروه منتقل کردند: ئێمەیان گواستەوە قوروە› ٤. تێگەیاندن؛ فامانـدن ‹هر چه تلاش کردیم، نتوانستیم مطلب را به آنها منتقل کنیم: هەر چێکمان کرد و کۆشا، نەمانتوانی لە مەبەستەکەیان تێبگەیێنین›.

**منت کش**[1] / mennatkeš/: [عربی/ فارسی]/اسم. ۱. منەت‌کێش؛ چاوبەرەژێر؛ لە دوو کەس کە پێکەوە شەڕیانە، ئەوەی کە دەیەوێ ئاشت بکاتەوە.

**منت کش**[2]: صفت. منەت‌کێش؛ چاوبەرەژێر؛ بنبار؛ بەر باری منەت.

**منت کشی** / mennatkešî/: [عربی/ فارسی]/اسم. منەت‌کێشی؛ چاودەبەری؛ کار و ڕەوتی؛

چاڤ‌دانان؛ منەت هەڵگرتن: ۱. منەت‌کێشان ۲. *[گفتاری]* کار و کردەوەی وا کە نیشاندەری داخواز بوون بۆ ئاشت بوونەوە بێ.

**منت‌گزار** / mennatgozār/: [عربی/ فارسی] *صفت.* پێزان؛ شوکرانەبژێر؛ سپاسگوزار.

**منتها**[1] / montahā/: [عربی]/*اسم.* ئەوپەڕ؛ ئاخر ‹منتهای تلاش خود را کرد: ئەوپەڕی هەوڵی خۆی دا›.

**منتها**[2]: *حرف.* بەڵام؛ وەلێکان ‹برو، منتها شب زود برگرد: برۆ، بەلام شەو زوو وەرەوە›.

**منتهی** / montahî/: [عربی] *صفت.* دواهاتوو؛ بڕاوە.

▣ **منتهی شدن:** دوایی هاتن؛ کۆتایی هاتن؛ بڕانەوە ‹این خیابان به آن میدان منتهی می‌شود: ئەم شەقامە بەو مەیدانە دوایی دیت›.

**منثور** / mansûr/: [عربی] *صفت.* پەخشانی؛ تایبەتمەندی نووسراوەی بەبێ کێش و قافیە. بەرانبەر: **منظوم**

**منجر** / moncar/: [عربی] *صفت.* گەیشتوو؛ کێشراو ‹کار به آنجا منجر شد که از هم متارکه کنند: کار گەیشتە ئەوێ لێک جیا ببنەوە›.

**منجلاب** / mancalāb ، ـها/: [از عربی ؟/ فارسی] *اسم.* ۱. زلقاو؛ تلۆل؛ چلپاو؛ حەریاتراو؛ چالەگەنکاو. ۲. *[مجازی، گفتاری]* تەنگ و چەلەمە.

**منجم** / monaccem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/*اسم.* ئەستێرەناس؛ ئەستێرەگەر.

**منجمد** / moncamed/: [از عربی] *صفت.* ۱. بەستوو؛ ڕچاو؛ ڕچیاگ؛ بیا؛ جەمەدی؛ یەخ‌بەستوو؛ یەخ‌کردوو؛ سەهۆڵ‌کردوو؛ ڕیق؛ لە سەرما ڕەق‌هەلاتوو ۲. *[گفتاری]* وشک و بێ‌جم‌وجووڵ ۳. *[گفتاری]* سارد و سڕ.

▣ **منجمد کردن:** ڕچاندن؛ قراندن؛ جەمداندن.

**منجمله** / mencomle/: [عربی] *حرف.* لەوانە؛ لەوانەدا؛ لەمانەدا؛ لەمانا؛ لەمانە؛ لەوناوەدا؛ چینیشانە ‹من‌جمله نالی و محوی را می‌توان نام برد: لەوانە دەتوانین نالی و مەحوی ناو ببەین›.

**منجنیق** / mancanîq ، ـها/: [معرب از یونانی]/*اسم.* مەنجەنیق؛ هێلکال: ۱. ئامرازی ئاگر هاویشتنە سەر قەلا لە شەڕدا ۲. جۆرێک گرانکێشی دەستی.

**منجوق** / moncûq, mancûq ، ـها/: [ترکی]/*اسم.* زەنگیانە؛ زەنیانە؛ زەنگیالێ؛ منمنە؛ منجوق؛ نمنۆک؛ نمنمۆک؛ نم‌نم؛ مەنجوخ؛ سسلە و پیلە؛ پلپلە؛ مووررووی زۆر وردی بریکەدار کە بۆ جوانی بە جل‌وبەرگیدا دەدروون.

**منجوق‌دوزی** / moncûqdûzî, mancûq-/: [ترکی/ فارسی]/*اسم.* زەنگیانەدووری: ۱. کاری زەنگیانە چنین ۲. جل‌وبەرگی زەنگیانە پێدا دورواو.

**منجی** / moncî ، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم.* ڕزگاریدەر؛ ڕزگارکەر؛ نەجاتدەر.

**منچ** / menč/: [؟]/*اسم.* منچ؛ مینچ؛ کایەی دوو، سێ یان چوار کەسی لە سەر پەڕەیەکی چوارگۆش، کە هەر کام لە کایەکەران چوار مۆرەی هاوڕەنگیان هەیە، دەبێ بە تاس هەڵخستن لە نێو خانووەکاندا بیانبەنە پێش، تا پاش خولێکی تەواو بگاتە مەنزڵ. لە سەر ڕێ دەکرێ لە مۆرەی هاوملەکانیان بدەن یان مۆرەی خۆیان بەر لێدان بکەوێ و بگەڕێنەوە خانی ئەوەڵ: **مینچ**

**منچو** / manču/:/*اسم.* مەنچوو: ۱. /ـها/ خەڵکی مەنچووری ۲. لە زمانەکانی ئۆراڵ- ئاڵتایی.

**منحرف**[1] / monharef/: [عربی]/*اسم.* *[هندسه]* چوارگۆشەی نارێک.

**منحرف**[2]: *صفت.* لادەر؛ کلا؛ هەتلە؛ ئاچمرێ: ۱. چەوت؛ دارای چەوتی ۲. لەڕێ‌لادەر ۳. /ـها؛ ـان؛ ـین/ ڕێ‌لێ‌گۆڕاو؛ بە بیر و کردەوەی نادروست.

▣ **منحرف شدن:** *[مجازی]* کلا بوون؛ خریان؛ لاڕێ بوون؛ تلاسان؛ زەلان؛ بە هەڵەدا چوون؛

له ڕێ دەرچوون.

**منحصر** / monhaser/: [عربی] *صفت*. تایبەت؛ بەندیوار.

**منحصربەفرد** / monhaserbefard/: [عربی/ فارسی/ عربی] *صفت*. تاقانە؛ تاکانە؛ تاقالە؛ تاک ‹فرزند منحصربەفرد خانواده: مندالی تاقانەی ماڵ›.

**منحط** / monhat(t)/: [عربی] *صفت*. بەفیڕۆچوو؛ ڕوو لە خەسار؛ نەوی.

**منحل** / monhal(l)/: [عربی] *صفت*. هەڵپێچراو؛ هەڵوەشاو؛ ئەوەپێچیا.

⊡ **منحل شدن**: هەڵپێچران؛ هەڵوەشانەوە؛ ئەوەپێچیەی ‹با تصمیم هیئت مدیره شرکت منحل شد: لە سەر بڕیاری لێژنەی بەڕێوەبەرایەتی بەشدارگەکە هەڵپێچرا›.

**منحل کردن**: هەڵپێچان؛ هەڵوەشاندنەوە؛ ئەوەپێتەی ‹شرکت را منحل کردند: بەشدارگەیان هەڵپێچا›.

**منحله** / monhalle/: [عربی] *صفت*. هەڵوەشاوە؛ هەڵپێچراو ‹شرکت منحله: بەشدارگەی هەڵوەشاوە›.

**منحنی**[1] / monhanî/: [عربی] *صفت*. ١. خط منحنی ☜ خط ٢. کەوانە؛ پێلە؛ نوانەی گۆڕانکاری (وەک زۆر بوونی جەماوەر یان نرخ).

⊡ **منحنی صعودی**: کەوانەی ڕووبەبان/ سەرەوژوور.

**منحنی نزولی**: کەوانەی ڕوو بە خوار/ سەرەوژێر.

**منحنی**[2]: *صفت*. چەماو؛ چەماوە؛ چەمیاگ؛ کووڕ؛ چەمیای ‹خط منحنی: هێڵی چەماو›.

**منحوس** / manhûs/: [عربی] *صفت*. بەودم؛ بێفەڕ؛ بەدفەڕ؛ دوموهر؛ دوومۆر؛ جووتقۆشە؛ قۆشە؛ واژەوەند؛ نەحس.

**منحول** / manhûl/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* دزراو؛ دزلێداو؛ دزبردوو.

**من‌حیث‌المجموع** / menheysolmacmû', menheyselmacmû'/: [عربی] *قید*. بە گشتی؛ سەرجەم؛ سەرهەم؛ لە ڕووی یەک؛ بە گشتەوە؛ لە سەر یەک ‹من حیث المجموع کار خوب پیش می‌رود: بە گشتی کار بە باشی دەڕواتە پێشێ›.

**منخرین** / manxareyn/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* برناخ؛ بڕناخێ؛ خمخمکان؛ خمخمان؛ دوو کونی لووت.

**- مند** / mand/: *پسوند*. ـ مەند؛ ـ مەن؛ ـ وەر؛ خاوەن ‹آرزومند؛ بهره‌مند: ئارەزوومەند؛ بەهرەوەر›.

**منداب** / mandāb ، ـها/: *اسم*. کناولە؛ کناوڵی؛ قناولە؛ قناولی؛ قنگاولە؛ گیایەکی ئالیکی یەک یان دووسالان بە گوڵی سپی مەیلەو زەرد یان پەمەیی و دەنکی چوارەوە.

**مندایی** / mandāyî/: *اسم*. مەندایی: ١. دینێکی باو لە باشووری عیراق و خووزستان، کە شوێنکەوتووانی خەت و زمانێکی تایبەتیان هەیە و ئاوی خوڕ و تیشکیان بەلاوە پیرۆزە: صُبّه ٢. ـها؛ ـان/ هەر کام لە شوێنکەوتووانی ئەو دینە

❋ **ماندایی**

**من‌درآوردی** / mandarāvardî/: *صفت*. *[گفتاری]* هەڵبەستە؛ درۆیی؛ خۆکردی؛ خۆدەرهێن؛ خۆهەڵبەست؛ لەخۆیی ‹خبرها و شایعه‌های من‌درآوردی: هەواڵ و بەنگوباوی هەڵبەستە›.

**مندرج** / mondarec, mondarac/: [عربی] *صفت*. نووسراو ‹این مطلب در کتاب فیزیک مندرج است: ئەم بابەتە لە کتێبی فیزیکدا نووسراوە›.

**مندرجات** / mondarecāt/: [عربی] *اسم*. نووسراوەگەل؛ کۆی ئەو شتانەی لە شوێنێکدا نووسراونهتەوە ‹مندرجات کتاب فیزیک: نووسراوەگەلی کتێبی فیزیک›.

**مندرس** / mondares/: [عربی] *صفت*. کۆنە؛ کۆن؛ شنگر؛ پواو؛ داڕزاو ‹لباس مندرس: جلوبەرگی کۆنە›.

**مندلفیم** / mendelefyom/: [فرانسوی] *اسم*. مەندلفیوم؛ توخمی شیمیایی کانزایی لە

دەستەی ئاکتنیدەکان، بە ژمارە ئەتۆمی ۱۰۱، کە بە شێوەی دەسکرد بەرهەم دێت: **مِندلویٖم**

**مندلک** / mandalak ، ـها/: اسم. کاهوەمارانە؛ گیایەکی پایا بە ڕیشووی ئەستوور و درێژ، چەن لاسک و گەڵای پانی سەوز و خۆراکیەوە کە هاوینان شین دەبێ: **کاهوی افعی**

**مندلویم** / mendelevyom/: [فرانسوی] ☜ **مِندلِفیٖم**

**مندلیسم** / mendelîsm/: [فرانسوی]/اسم. مەندیلیسم؛ سەرجەمی بنەما و کارکردی قانوونی مەندیل.

**مندیل** / mandîl ، ـها/: [عربی]/اسم. مێزەر؛ مێزەرە؛ سەرپێچ؛ شاشک؛ دەسماڵ سەر؛ دەسرەی سەرپێچان.

**منزجر** / monzacer/: [عربی] صفت. وەڕەز؛ وەڕز؛ جاڕز؛ وێرس؛ وێزار؛ بێزار؛ قەڵس؛ یاس؛ گیانەسەر ‹با رفتار خود همه را منزجر کرد: بە کردەوەی خۆی هەمووی وەڕەز کرد›.

**منزجرکننده** / monzacerkonande/: [عربی/ فارسی] صفت. بێزارکەر؛ وەڕەزکەر.

**منزل** / manzel ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. /منازل/ ماڵ؛ خانوو؛ خانە؛ یانە؛ خانک؛ خانگ؛ خانی؛ مار؛ هوونە؛ دەمانە ۲. *[مجازی]* خان؛ ماڵ؛ خانەخان؛ قۆناغ ‹هنوز در منزلِ اوّل این کار بزرگ هستیم: هێشتا لە خانی یەکەمی ئەم کارە گەورەداین› ۳. *[مجازی]* بەر؛ مەقسەد ٤. *[مجازی]* جێ؛ جێگا؛ شوێن ٥. مەنزڵ؛ یەکەی کۆنی ڕێگا، ئەوندەی شەش فرسەخ، سیوشەش کیلۆمیتر.

▣ **منزل کردن**: نیشتەجێ بوون؛ هێورین ‹در هتل منزل کردیم: لە هوتێل نیشتەجێ بووین›.

**منزلت** / manzelat, manzalat ، ـها/: [عربی]/اسم. وەج؛ قەدر؛ پلە و پایەی کۆمەڵایەتی.

**منزلگاه** / mazelgāh ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. گیهانەک؛ جاماڵ؛ ماڵگە؛ شوێنی مانەوە و هێورین لە ناو ڕێ.

**منزله** / manzele, manzale/: [عربی] ☜ بە **منزلەی**

**منزوی** / monzavî ، ـها/: [عربی] صفت. گۆشەگیر؛ سووچنشین؛ دوورەپەرێز؛ دووریگر؛ کونجگر؛ قورنەتگیر؛ لاتەریک.

**منزه** / monazzah/: [عربی] صفت. پاک؛ خاوێن؛ پاقژ؛ پاکژ؛ پاک و پوار.

**منسجم** / monsacem/: [عربی] صفت. تۆکمە؛ یەکپارچە.

**منسوب**[1] / mansûb ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. ۱. بەندیوار؛ بەستراو ۲. خزم؛ کەس؛ کەسوکار.

**منسوب**[2]: صفت. هاوگەر؛ پێوەندیدار.

**منسوج** / mansûc ، ـات/: [عربی]/اسم. ۱. کر؛ تەنراو؛ چنراو؛ تەون؛ جۆلاییکراو ۲. *[قدیمی]* گنج؛ کنج؛ هنجگ؛ جلوبەرگ.

**منسوخ** / mansûx/: [عربی] صفت. هەڵگیراو؛ هۆرگیریا؛ لەباوکەوتوو؛ بێبرەو ‹این رسمها دیگر منسوخ شده است: ئەم داب و نەریتانە ئیدی هەڵگیراون›.

**منسی** / mansî/: [عربی] صفت. *[ادبی]* لەبیرچوو؛ لەبیرکراو؛ فەرامۆشبوو؛ فەرامۆشکراو.

**منش** / maneš ، ـها/: اسم. تووک؛ خۆوخدە؛ گەد؛ ڕەوشت؛ شێوازی جووڵانەوە لەگەڵ خەڵک، بە گوێرەی کەسایەتی و دۆزەنەیەکی بایەخی دیاریکراو.

**منشآت** / monša'āt/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* کۆمەڵە نامە؛ نامەگەل؛ نامێ.

**منشأ** / manša'/: [عربی]/اسم. سەرچاوە: ۱. ـها/ ژێدەر؛ بنەما؛ سەرچاوکە؛ زاگە ۲. *[مجازی]* هۆ؛ بۆنەی سەرهەڵدان ‹امیدوارم بتوانم منشأ خدمتی بشوم: هیوادارام بتوانم ببمە هۆی خزمەتێک›.

▣ **منشأ گرفتن**: سەرچاوە/ سەرچاوکەگرتن؛ سەرهەڵدان؛ وەشانەوە؛ بەدیهاتن؛ لێدەرهاتن؛ لێدەرکەوتن ‹همەی این مشکلات

از گرانی منشأ می گیرد: هەموو ئەم گرفتانە لە گرانیەوە سەرچاوە دەگرن›.

**منشعب** / monša'eb/: [عربی] *صفت*. ۱. لق ـ لق؛ شاخه ـ شاخه؛ پەل ـ پەل ۲. پەلکێش؛ لێوەبوو؛ ئاژۆ ‹در اینجا جاده منشعب می‌شود: لێرەدا جادەکە پەلکێش دەبێ› ۳. جیاوەبوو؛ لێوەبوو ‹گروه منشعب از حزب: تاقمی جیاوەبوو لە حیزب›.

**منشور** / manšûr ، ـها/: [عربی]/*سم*. ۱. پەخشنامە؛ ئاگاداری؛ بلاوکراوە؛ بەلاڤۆک ‹منشور حقوق بشر: پەخشنامەی مافی مرۆ› ۲. *[هندسه]* پوازک؛ تەشکێکی چەن‌پاڵوو ۳. ئاوێزە؛ تەنێکی ڕوون بە دوو لاپاڵی ناهاوشان بۆ لارکردنەوە و شی‌کردنەوەی لیزگی تیشک.

**منشی** / monšî ، ـها؛ ـان/: [عربی]/*سم*. ئینشابەند؛ سەرقەڵەم؛ مونشی: ۱. ئەو کەسە کاروبار و نامەی نووسینگەی سەرۆک بەڕێوە دەبا ۲. ئەو کەسەی باس و بڕیاری دانیشتنێک دەنووسێتەوە.

⊡ **منشی تلفنی** ☜ **پیامگیر**

**منشی صحنه**: مونشی نیار/ شانۆ؛ ئەو کەسەی هەموو وردەکاریەکانی سەر شانۆی فیلم تۆمار دەکا و پێیان ڕادەگا.

**منشیگری** / monšîgarî/: [عربی/ فارسی]/*سم*. کار یان پیشەی مونشی.

**منصب** / mansab ، ـها؛ مناصب/: [عربی]/*سم*. ۱. پلە؛ پایە ۲. پیشە؛ ئیش؛ کار (بەتایبەت کاری گرینگ).

**منصرف** / monsaref/: [عربی] *صفت*. پاشگەز؛ دەسهەڵگر؛ پەشیمان ‹از تصمیم خودم منصرف شدم: لە بڕیارەکەم پاشگەز بوومەوە›.

**منصف** / monsef ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. بە ئینساف؛ دادپەروەر.

**منصف الزاویه** / monassefozzāviye/: [عربی] ☜ **نیمساز**

**منصفانه**[1] / monsefāne/: [عربی/ فارسی] *صفت*. دادپەروەرانە.

**منصفانه**[2]: *قید*. لە ڕووی ئینسافەوە؛ بە ئینسافەوە؛ بە دادپەروەریەوە ‹منصفانه قضاوت کن، ببین حق با کیست: بە ئینسافەوە دادوەری بکە، بزانە کێ ڕاستە›.

**منصوب** / mansûb ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت*. دانراو؛ ڕاسپاردە؛ ڕاسپارە.

⊡ **منصوب شدن**: دانران؛ ڕاسپێردران ‹به ریاست مدرسه منصوب شد: بۆ سەرۆکایەتی قوتابخانە دانرا›. هەروەها: **منصوب کردن**

**منصور** / mansûr/: [عربی] *صفت*. *[ادبی]* سەرکەوتوو.

**منضبط** / monzabet/: [عربی] *صفت*. مرێس؛ تەکووز؛ ڕێکوپێک.

**منضم** / monzam/: [عربی] *صفت*. پێوەلکاو؛ پەیوەست‌کراو؛ دەپاڵ‌خراو.

**منطبق** / montabeq/: [عربی] *صفت*. بەرانبەر؛ بەرامبەر ‹منطبق با حقیقت است: بەرانبەر بە ڕاستیە›.

**منطق** / manteq/: [عربی]/*سم*. ۱. مەنتیق؛ زانستی سەلماندن و ئاکام لێوەرگرتنی قسە و باس ۲. *[مجازی]* بەڵگە و بڕنۆی ژیرانە ۳. *[مجازی]* بیری دروست ٤. *[مجازی]* شێوازی هشاندن؛ تێفکرین ۵. وتە؛ وتار؛ گوتە ٦. *[قدیمی]* زمان؛ زوان ۷. *[قدیمی]* کار و ڕەوتی پەیڤین؛ ئاخاوتن؛ چەلمین.

**منطق** / monteq/: [عربی] ☜ عدد گویا، **عدد**

**منطقدان** / manteqdān ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم*. مەنتیق‌زان؛ پسپۆڕی مەنتیق.

**منطقه** / mantaqe ، ـها؛ مناطق/: [عربی]/*سم*. ناوچە؛ ناڤچە؛ ناوان؛ هەرێم؛ هەوێرکە؛ قاچ؛ مەڵبەند؛ ئاقار؛ کاڤار: ۱. بەشێک لە ڕووبەرێک ‹منطقه‌ی وسیعی را آب فراگرفته بود: ئاو ناوچەیەکی زۆری داگرتبوو› ۲. سەرزەوین؛ دیو ‹منطقه‌ی کردنشین: مەڵبەندی کوردان› ۳. *[جغرافیا]* هەر

بەشێکی گۆی زەوی ‹منطقه‌ی گرمسیری: ناوچەی گەرمەسێر› ٤. ولکە؛ ئولکە؛ ئۆلکە؛ محاڵ؛ مەهال؛ کۆمەڵە ئاوایی یان کۆمەڵە شەقام و کۆلانی ناوشار کە سەر بە ناوەندێکن.

◘ منطقه‌ی استوا: ناوچەی ئوستوا؛ بەشێ لە گۆی زەوی لە نێوان ′۲۷ °۲۳ بەری باکووری و باشووریدا کە هەمیشە گەرمە و گۆڕانی وەرزی تێدا بەدی ناکرێ.

منطقه‌ی حارّه ☜ **مَدارگان**

منطقه‌ی قطب ☜ **منطقه‌ی منجمد**

منطقه‌ی معتدل: ناوچەی فێنک؛ هەر کام لە دوو بەشی گۆی زەوین لە نێوان ناوچەی ئوستوا و ناوچەی بەستەڵەکدا.

منطقه‌ی منجمد: ناوچەی سەهۆڵبەندان؛ ناوچەی بەستەڵەک/ تلوونج؛ هەر کام لە دوو جەمسەری گۆی زەوی لە نێوان دوو بەری ′۳۳ °٦٦ باکووری و باشووریدا کە هەمیشە سەرد و ڕچەیە: **منطقه‌ی قطب**

**منطقه‌البروج** / mantaqatolburûc,-borûc/: [اعربی] ☜ **دایرةالبروج**

**منطقه‌ای** / mantaqe'î/: [اعربی] *صفت*. ناوچەیی؛ هەرێمی؛ سەر بە ناوچە.

**منطقی** / manteqî/: [اعربی] *صفت*. ژیرانە؛ گونجاو؛ ڕێک و تەبا ‹عمل منطقی؛ حرف منطقی: کاری ژیرانە؛ قسەی گونجاو›.

**منظر** / manzar/: [اعربی]/*اسم*. دیمەن: ١. ڕوانگە؛ پێشچاو؛ چاوگە؛ دیامان؛ خویانەک؛ بەرجەوەن؛ بەرژەوەند؛ شوێنی لێڕوانین ‹از منظر علم فیزیک: لە ڕوانگەی زانستی فیزیکەوە› ٢. ڕەنگ و ڕوو؛ سیما.

**منظره** / manzare، ـها؛ مناظر/: [اعربی]/*اسم*. دیمەن؛ دیا: ١. ئەوەی بەرچاو دەکەوێت ‹آن منظره همیشه پیش چشمم مجسم می‌شود: ئەو دیمەنە هەموو کات دێتە بەرچاوم› ٢. وێنەی لە دوورەوەی سروشت ‹منظره‌ی طبیعت می‌کشید و می‌فروخت: دیمەنی سروشتی دەکێشا و دەیفرۆت› ٣. دیامان؛ ڕوانگە؛ بەرژەوەند؛ بەرجەوەن.

**منظم** / monazzam/: [اعربی] *صفت*. تەکووز؛ تەکویز؛ تەکویس؛ ڕێکوپێک؛ لەبار؛ پۆڕ ‹کار منظم: کاری تەکووز›.

**منظور** / manzûr، ـها/: [اعربی]/*اسم*. مەبەست؛ مخەت؛ مەبەس؛ چەمک؛ نیاز.

◘ **منظور داشتن**: ١. دانان ‹این کار را برای شما منظور داشتم: ئەم کارەم بۆ ئێوە دانا›: **منظور کردن** ٢. مەبەست بوون ‹از این حرف منظور داشت: لەم قسەیە مەبەستێکی بوو›.

منظور کردن ☜ **منظور داشتن ـ١**

**منظوم** / manzûm/: [اعربی] *صفت*. هۆنراو؛ هەڵبەستە؛ هەڵبەستراو؛ بە شێوەی شیعر. بەرانبەر: **منثور** ‹حکایت منظوم: داستانی هۆنراو›.

**منظومه** / manzûme، ـها/: [اعربی]/*اسم*. ١. هەڵبەست؛ هۆنراوە؛ داستان یان بەسەرهاتێکی هۆنراوە ‹منظومه‌ی خَج و سیامند: هەڵبەستی خەج و سیامەند› ٢. *[نجوم]* کۆمەڵە؛ گۆی گەڕۆک و مانگێ کە لە دەوری ئەستێرەیەک هەڵدەسوورێن ‹منظومه‌ی شمسی: کومەڵەی ڕۆژ›.

◘ **منظومه‌ی شمسی**: کۆمەڵەی ڕۆژ؛ خۆر، زەوین و هەشت گەڕۆکی دیکە و مانگەکانیان.

**منع** / man'/: [اعربی]/*اسم*. بەرگری؛ بەرگیری؛ بەربەست؛ مەنع؛ کار و ڕەوتی ڕێگە نەدان؛ بەرگرتن؛ نەهێشتن؛ نەهێڵان. هەروەها: **منع شدن؛ منع کردن**

**منعقد** / mon'aqed/: [اعربی] *صفت*. ١. بەسراو؛ بەستراو (بۆ پەیمان) ٢. ئەماس؛ مەیو؛ مەییو؛ مەیس؛ گرساو؛ گرسی (بۆ تراو) ٣. کار و ڕەوتی بەڕێوە چوون ‹مراسم عروسی منعقد شد: ڕێوڕەسمی زەماوەند بەڕێوە چوو›.

**منعکس** / mon'akes/: [اعربی] *صفت*. هەڵگەڕاوە؛ وەرگەڕاو؛ هەڵگەڕاو؛ هەڵەوگەڕیاگ؛ تووشی

گەڕانـەوە بـوو ‹نـور مـنعكس از آيينـه: تيشـكى هەڵگەڕاوە لە ئاوێنە›.

**منعم** / mon'em ، ـان؛ ـين/: [عربـی] *صـفت. [ادبی]* دارا؛ مايەوەر.

**من غيرمستقيم** / menqeyremostaqîm/: [عربـی] *قيد.* ناڕاستەوخۆ ‹من غيرمستقيم بـه او فهمانـدم كـه نخواهم رفت: ناڕاستەوخۆ تێمگەياند كە ناڕۆم›.

**منفجر** / monfacer/: [عربی] *صفت.* تەقيو؛ تـەقاو؛ تەقيگ؛ تەقياگ؛ تەقياى؛ ترەقيو؛ پەقيو.

▣ **منفجر شدن:** تەقين؛ تەقيان؛ پـەقين؛ پـەقان؛ پۆقيـان؛ تەقينـەوە؛ تەقانـەوە؛ تەقيانـەوە؛ ئەوەتەقەى؛ تەقايوە؛ ترەكين ‹مين منفجـر شـد: مينەكە تەقيەوە›.

**منفجر كردن:** تەقاندنـەوە؛ تـەقانن؛ تەقانـدن؛ بەقتاندن؛ پەقاندن؛ تەرەقاندن؛ ئەوەتەقنـەى؛ تەقنايوە؛ ترەقاندن؛ گودە؛ هەڵترەكان ‹يک پل را منفجر كردند: پردێكيان تەقاندەوە›.

**منفذ** / manfaz ، ـها؛ منافذ/: [عربـی] */اسم.* دەروو: ١. مـاوش؛ كـون؛ كونـا؛ ولـە؛ تەشـە؛ واجـە ٢. دەربيجە؛ دەريچە ٣. *[ادبی]* بوارگە؛ جێبگار.

**منفرجه** / monfarece/: [عربی] *صـفت.* ١. ئـاوەڵا؛ گوشا؛ كراوە ٢. ☜ زاويەى منفرجە، **زاويه**

**منفـرد** / monfared/: [عربـی] *صـفت.* ١. تـەنيا؛ تەنها؛ تـاک ٢. /ـان؛ ـين/ سـەربەخۆ ‹نماينـدەى منفرد: نوێنەرى سەربەخۆ›.

**منفصل** / monfasel/: [عربی] *صفت.* ١. *[نامتـداول]* جياوەبوو؛ جيابووگ؛ جياوەبيـە ٢. جيـا؛ جـوێ؛ جگا ٣. لابراو؛ داتەكيو؛ دابڕاو ‹از سـمتش منفصـل شد: لە كارەكەى لابرا›.

**منفعـت** / manfa'at ، ـهـا؛ منـافع/: [عربـی] */اسم.* قازانج؛ بەهرە؛ فێدە؛ هاڤل؛ سوود.

▣ **منفعت بردن:** قازانجكردن؛ بەهرە بردن؛ هاڤل بوون. هەروەها: **منفعت داشتن؛ منفعت كردن**

**منفعـل** / monfa'el/: [عربی] *صفت.* ١. بـەركار؛ وەبەر ڕوودانى كارێـک ٢. *[مجـازى]* شـەرمەزار؛ شـەرمزار؛ تەريقـەوەبووگ؛ خەجاڵـەتبار؛ بەخۆداشـكاو ‹از رفتـار خـودش منفعـل شـد: لـە كردەوەى خۆى شەرمەزار بوو› ٣. بـێدەسـەلات؛ لەكارتە؛ پەككەوتە ‹نيروهاى ملـى منفعـل بودنـد و كودتاچيان فعال: هێزەكانى گەل بێدەسەلات بوون و كوودەتاچيەكان بەكار› * **انفعالى**

**منفـک** / monfak(k)/: [عربـی] *صـفت.* ١. جياوەبوو؛ لێوەبوو ٢. كەنراو؛ دابڕاو.

**منفور** / manfûr/: [عربی] *صفت.* نەگەويس؛ پێرم؛ بـەر بێزكـەوتوو؛ بـەر ڕقكـەوتوو؛ (لـە) بـەر چاوكەوتوو؛ كەسنەويس ‹او در آن شهر منفور بـود: (ئەو) لەو شارەدا نەگەويس بوو›.

**منفـی** / manfî/: [عربـی] *صـفت.* ١. نـەرێنى؛ بـە كردەوەى پێچەوانە، دژ، ناتەبا و بێقازانج ‹پاسخ منفی: وەلامـى نـەرێنى› ٢. *[برق]* بـە ئـەلكترۆنى زيادیـەوە؛ ئەلكترۆنـدەر ٣. *[رياضـی]* ☜ عـدد منفى، **عدد** * بەرانبەر: **مثبت**

**منفی‌بافی** / manfîbafî ، ـها/: [عربی/ فارسی] */اسم.* دەمسـاردى؛ كـار و ڕەوتى گـوتنى قسـەى ناهمێدانـە، نەيارانـە و ڕەشـبينانە. هـەروەها: **منفی‌باف**

**منقاد** / monqād, menqād/: [عربی] *صفت. [ادبـی]* فەرمانبەر؛ گوێڕايەڵ؛ گوێبيس.

**منقار** / menqār ، ـها/: [عربی] */اسم.* نـک؛ نـووک؛ دەندووک؛ دەنووک؛ دندووک؛ دندوک؛ دندوول؛ نكل؛ نيكل؛ نكول؛ نوكل؛ نوكوول؛ شەند؛ نـەقور؛ لێوى ڕەقهەلاتووى پەلەوەر.

**منقاش** / manqāš/: [عربی] ☜ **مقاش**

**منقبـت** / manqabat ، ـهـا؛ مناقـب/: [عربـی] */اسم.* شكۆ؛ ئەوەى دەبێتە هۆى سەرترى و گـەورەيى كەسێک ‹شرح مبسـوطى در مـدح و منقبـت او اظهـار داشت: ڕاڤەيەكى چڕوپڕى لە پەسـن و شكۆى ويـدا دەربڕى›.

**منقبض** / monqabez/: [عربـی] *صـفت.* كـرژ؛ ڕچ؛ وێكهاتوو. بەرانبـەر: **منبسط** ‹اجسام بـر اثـر گرما

منقبض می‌شوند: شت بە هۆی سەرماوە کرژ دەبێتەوە›. هەروەها: **منقبض شدن؛ منقبض کردن**

**منقح** / monaqqah/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ١. خاوێن‌کراو؛ پاک‌کراو ٢. ڕازێنراو؛ چاک‌کراو.

**منقد** / monaqqed ، ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ڕەخنەگر؛ ئەوەی باش و خراپ یان عەیب و تەرزی شتێک هەڵدەسەنگێنێ و دەیناسێنێ.

**منقرض** / monqarez/: [عربی] *صفت.* بنەبڕ؛ کوێرەوەبوو؛ کۆرەوەبوو؛ قڕان‌هاتوو؛ قڕتێکەوتوو؛ هەڵپێچراو؛ دوابڕاو؛ هەڵپێچراو ‹سلسلەی قاجار در سال ١٣٠۴ منقرض شد: زنجیرەی قەجەر لە ساڵی ١٣٠٤دا بنەبڕ بوون›.

**منقسم** / monqasem/: [عربی] *صفت.* دابەش بوو؛ بەش- بەش‌کراو؛ بەشەوکریاگ ‹سرمایەی شرکت منقسم بە صد سهم است: سەرمایەی بەشدارگە دابەش بووە بە سەد بەش›.

**منقش** / monaqqaš/: [عربی] *صفت.* نەخشین؛ نەقشین؛ نگارین؛ نەخشاو؛ ڕەنگاوڕەنگ؛ نەخشار؛ نەخشدار.

**منقضی** / monqazî/: [عربی] *صفت.* تێپەڕیو؛ تەواو بووگ؛ دوایی هاتوو؛ بگردگ ‹مهلت ثبت‌نام منقضی شدە است: ماوەی ناونووسی تێپەڕیوە›.

**منقطع** / monqate'/: [عربی] *صفت.* بڕاو؛ داپچڕاو؛ دابڕاو؛ پساو؛ بڕیاگ؛ بڕیاو.

**منقل** / manqal ، ـها/: [از عربی] *اسم.* تەفایە؛ مەقەلی؛ مقەلی؛ مەنقال؛ مەنقەل؛ مەنقەڵە؛ مەنگەڵ؛ مەنگەلی؛ مەنگەلیە؛ سۆچێو؛ دەفری خەڵووز و سکڵ تێ‌کردن لە کانزا بۆ چز و بز.

▣ **منقل برقی:** مەنقەڵی کارەبایی.

**منقلب** / monqaleb/: [عربی] *صفت.* ١. هەڵشێواو؛ هاژ و واژ ٢. بارەوباربوو؛ داگەڕاو؛ هەڵگەڕاو.

**منقور** / manqûr/: [عربی] *صفت. [ادبی]* هەڵکەنراو؛ هەڵقەنراو؛ نووسراوە یان نەخشی بە سەر شتێکەوە (وەک بەرد) دەرهاتوو.

**منقوش** / manqûš/: [عربی] *صفت. [ادبی]* نەخشاو؛ نەخشیو؛ نەخش‌کراو.

▣ **منقوش کردن:** نەخشاندن؛ هێڤشاندن.

**منقوط** / manqût/: [عربی] *صفت.* نوقتەدار؛ خاڵدار.

**منقول** / manqûl/: [عربی] *صفت.* ١. *[نامتداول]* گوێزراوە؛ ڕاگوێزراوە ٢. گەڕێنراو؛ گێڕدراوە ‹از انوشیروان منقول است کە...: لە ئەنووشیروانەوە گێڕدراوەتەوە کە...› ٣. ڕاگوێزرانی.

**منکر** [1] / monkar ، ـات/: [عربی] *اسم. [اسلام]* مونکەر؛ کارێ کە بە پێچەوانەی دینە.

**منکر** [2]: *صفت.* کەسن؛ دزێو؛ نەچێ؛ سک؛ کرێت؛ ناشیرین؛ نادروست.

**منکر** / monker ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ئینکارکەر؛ حاشاکەر.

▣ **منکر شدن:** حاشا لێ کردن؛ ئینکارکردن ‹او نوشتن آن مقالە را بە کلی منکر شد: (ئەو) بە تەواوی حاشای لە نووسینی ئەو گوتارە کرد›.

**منکسر** / monkaser/: [عربی] *صفت. [ادبی]* داشکاو؛ شکاو ‹خط منکسر: هێڵی داشکاو›.

**منکوب** / mankûb/: [عربی] *صفت. [ادبی]* سەرکوت‌کراو؛ داتەمراو ‹شورشی منکوب: یاخی سەرکوت‌کراو›.

**منگ** / mang/: *صفت.* گێج؛ گێژ؛ کاس؛ وڕ؛ وەم؛ سەرەتاساو؛ تووشیاری ئاڵۆزی و شێواوی هزر و بیر.

**منگنز** / manganez/: [فرانسوی] *اسم.* مەنگەنیز؛ توخمی شیمیایی بە ژمارەی ئەتۆمی ٢٥ و کێشی ئەتۆمی ٥٤,٩٣، کانزایەکی نەرم و تورت و بە ڕەنگی سپی مەیلەو بۆر کە لە ئەسیددا دەتوێتەوە و بۆ بەرهەم هێنانی ئالیاژ کەڵکی لێ دەگرن.

**منگنه** / mangane, mangene ، ـها/: [ترکی] *اسم.* مەنگەنە؛ مەنگەن: ١. ئەشکنجە؛ ئەشکەڵە؛ جەڕ؛ مەڵگەز؛ ماوش؛ کەرستەیەک بۆ جەڕ دان،

ڕاگرتن و کون‌کردنی شت ٢. ئاڵقەیەکی کانزایی بۆ کون‌کردنی شتێک کە بە سەریدا پەرچی دەکەن (وەک ئاڵقەی کونی بەنی کەوش).

⊡ **منگنه کردن:** گیره لێ دان؛ مەنگەنەکردن ‹دگمه‌ها را منگنه کرد: دوگمەکانی گیره لیدا›.

**منگول** / mongol ، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* مونگول؛ تووشیاری نەخۆشی مونگولیسم.

**منگوله** / mangûle ، ـها/: *اسم.* گوڵەنگ؛ گوڵنگ؛ گوڵنگە؛ گوڵێنە گوڵەنگە؛ گولیفینک؛ گیفک؛ گیڤک؛ گوفک؛ گولیفک؛ ڕەشالووک؛ ڕیشوو؛ ریشوه؛ ڕیشی؛ فسکول؛ خشڵی سەر جل، کڵاو، کەوش و شتی وا، لە چەن تاڵە بەن کە سەرێکیان پێکەوە بەستراوە و سەرەکەی تریان داکەوتووە و ئاوێزانە.

**منگولیسم** / mongolîsm/: [فرانسوی] *اسم.* *[پزشکی]* مونگولیسم؛ کەمایەسیەکی زگماکی، وێڕای دواکەفتەیی زەینی، کاپۆڵی پان و کورت و چکۆلە، چاوی خێل، کەپۆی پەخ، دەستی پان و قامکی کورت.

**منگی** / mangî/: *اسم.* هوڕی؛ گێژی؛ گێجی؛ وڕی؛ تاساوی؛ تاسیاگی.

**منم ـ منم** / manam.manam ، ـها/: *اسم.* *[گفتاری]* من ـ من؛ خۆم ـ خۆم؛ قسەی خۆ هەڵکێشان ‹این منم ـ منم یک روز کار دست می‌دهد: ئەم من ــ منە ڕۆژێ پەنێکت پێ‌دەدا›.

**من ـ من** / menmen/: *اسم.* منجه‌منج؛ گنەگن؛ منگەمنگ؛ مینگەمینگ؛ گوڤڤی؛ قسەی بە پرتە و سرتەوە ‹قدری مِن ـ مِن کرد و رفت: نەختێک منجەمنجی کرد و ڕۆی›: **من‌ومن**

**منژیت** / menanjît/: [فرانسوی] *اسم.* مینەنژیت؛ نەخۆشی چلکی پەردەی مێشک، کە لەگەڵ تا، سەرێشە و ڕشانەوەدایە.

**منو** / meno, menû ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* مێنۆ: ١. پێرستی خواردەمەنی ٢. پێرستی نێو کەمپیوتەر.

**منوال** / menvāl/: [عربی] *اسم.* شێوە؛ زێ؛ ڕەوشت؛ پێ‌وڕێ ‹کار با این منوال پیش نمی‌رود: کار بەم شێوە ناڕواتە پێشەوە›.

**منور** / monavvar/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* ڕۆشن؛ ڕووناک؛ ڕۆهن؛ ڕوهن.

**منوره** / monavvare ، ـها/: [عربی] *اسم.* *[نظامی]* نوورپژێن؛ تەقەمەنی تایبەت بۆ ڕوون‌کردنەوە بە مەبەستی ڕووناکی (تیشکی سپی) و هەواڵ دان (تیشکی ڕەنگی).

**منوسیت** / monosît ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* *[زیست‌شناسی]* مونۆسیت؛ گلوبوولی سپی یەک ناوکە.

**منوط** / manût/: [عربی] *صفت.* بەسراو؛ وابەستە؛ بە مەرج ‹استخدام شما منوط به موافقت رئیس است: دامەزرانی ئێوە بەسراوەتە تەبایی سەرۆکەوە›.

**منوکسید** / monoksîd ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* *[شیمی]* مونوکسید؛ ئوکسیدێک بریتی لە یەک ئەتۆمی ئوکسیژن لە مولوکوولێکدا.

⊡ **منوکسید کربن:** مونوکسیدی کەربون؛ گازێکی بێ‌ڕەنگ و ژاراوی کە لە بەرێکەوە لەگەڵ ئاودا تێکەڵ دەبێ و لە سووتانی ناتەواوی کەربۆنەوە بەرهەم دێ: **کربن منوکسید**

**منوگامی** / monogāmî/: [؟] *اسم.* تاکەهاوسەری؛ تاکەهاوژینی.

**منولوگ** / monolog ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* تاکەبێژی.

**منومر** / monomer ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* مونۆمێر؛ ماکی شیمیایی پێکهاتوو لە مولوکوولگەلی تاکی یەکدەست.

**من‌ومن** / menn-o-men/ ☜ **مِن ـ مِن**

**منویات** / manvîyyāt/: [عربی] *اسم.* ویست؛ نیاز؛ خواست ‹در اجرای منویات ایشان: لە بەڕێوە بردنی ویستی ئەواندا›.

**منها** / menhā/: [عربی] *اسم.* ١. *[گفتاری]* کار و

ڕەوتی داشکاندن؛ لێداشکان؛ لێدەرکردن ٢. کورتە هێڵێک لە نێوان دوو ژمارەدا بۆ لێداشکانی ژمارەی یەکەم لە دووهەم (وەک: ٧-٥-١٢) ٣. نیشانەی چەنیەتی کەمتر لە سیفر (-٣).

▣ **منها کردن**: داشکاندن؛ لێدەرکردن؛ لێ داشکان؛ کەمکردن.

**منهدم** / monhadem/: [عربی] *صفت*. کاول؛ وێران؛ ڕووخاو؛ ڕمیاگ؛ ڕخیاو؛ ڕمیاو ‹چندین خانه بر اثر سیل منهدم شد: چەن ماڵ بە هۆی لافاوەوە کاول بووە›.

**منی** / manî/: [عربی] *اسم. [فیزیولوژی]* ئاو؛ تۆماو؛ شاوەت؛ ئاوی پشت؛ ئاوی تێکەڵ بە ئیسپێرم لە نێری پێگەیشتوو.

**منیت** / manîyyat ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم*. خۆبەزلزانی؛ خۆپەسێنی؛ خۆپەسندی.

**منی‌دانه** / manîdāne/: [عربی/ فارسی] *اسم*. ئیسپێرم؛ خانەی بزۆزی جینسی لە گیانداری نێردا.

**منیر** / monîr/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ڕەوشێنەر؛ ڕۆشنایی‌دەر؛ ڕووناکی‌دەر.

**منیزی** / manyazî/: [فرانسوی] *اسم. [شیمی]* ئۆکسیدی مەنیەزیوم.

**منیزیم** / manyaz(i)yom/: [فرانسوی] *اسم*. مەنیەزیوم؛ توخمی شیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتومی ١٢ و کێشی ئەتۆمی ٢٤,٣٠، بە ڕەنگی سپی زیوکار کە لە ئاودا ناتوێتەوە و بە ڕووناکایی زۆرەوە گڕ دەگرێ، بە زۆری لە ئاوی دەریادا هەیە و لە بەرهەم هێنانی ئالیاژگەلی سووک، پاکژکردنەوەی شەکر، دەواسازی، وێنەگری و شیشەسازیدا بە کەڵک دێت.

**منیع** / manî'/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ١. بەرز؛ بڵند؛ بڵیند ٢. پایەبەرز؛ پایەبڵند.

**مو** / mow, mo: ، ـها/: *اسم*. مێو؛ مۆو؛ مێوی؛ مەیب؛ بنی‌ڕەز؛ داری هەنگوور؛ داری تری؛ مەیڤی؛ دەوەنێکی هەڵچوو لە تیرەی ڕەزان کە بە شتدا هەڵدەگەڕێ و پێوەی دەنووسێ، بەرێکی هێشوویی ئاودار (ترێ) دەگرێ.

**مو** / mû ، ـها/: *اسم*. موو؛ موی؛ موویە: ١. تاڵی ناسک و پتەوی سەر و لەشی زۆربەی گوانداران بەتایبەت مرۆ ٢. *[مجازی]* مەودای زۆر کەم ٣. *[مجازی]* هەر شتێکی کەمووسکە.

▣ **مو به مو** ☜ **موبەمو**

**موسرخ** ☜ **سرخمو**

**موسفید** ☜ **سفیدمو**

**موقرمز** ☜ **سرخمو**

**موی بافته**: پەلکە؛ پەلکێ؛ کەزی؛ قژی چێنراو؛ قژی پەلکەکراو؛ پرچی هۆنراو.

**موی دماغ**: *[کنایی]* مووی لووت؛ دەردیسەردەر؛ موزاحیم. هەروەها: **موی دماغ شدن**

**موی زهار**: تووکەبەر؛ چوخت؛ ڕووف؛ ڕۆفک؛ ڕوم؛ ڕوومی؛ کەڵەمڕ؛ ڕیڤ؛ ڕووی؛ ڕێو؛ مورت؛ زار؛ زارە؛ مووچک؛ مردار؛ بەرەتووک؛ بەرەتووکی؛ مووی بەر گەدە.

▣ **مو بر/ به تن کسی راست/ سیخ شدن**: *[کنایی]* مووی لەشی کەسێ سنگ ـ سنگ بوونەوە؛ مووی کەسێک ڕاست بوون؛ موچڕک بە لەشدا هاتن (لە بەر ترسی زۆر).

**مو برداشتن**: *[مجازی]* ترەک هەڵگرتن؛ زەنگ/ درز بردن (بۆ ئێسک یان دەفری بلۆر و چینی).

**مو را از دمش گرفتن**: *[کنایی]* لە ڕادەبەدەر بە وردەکاریەوە خەریک بوون.

**مو را از ماست کشیدن**: *[کنایی]* موو لە ماست کێشان؛ زۆر ورد و سەرنجدەر بوون، بەتایبەت لە حسێب و کتێبدا.

**مو لای درز چیزی نرفتن**: *[کنایی]* موو تێ نەچوون؛ بێ‌قسە بوون؛ بێ‌عەیب و خەوش بوون.

**مو نزدن**: *[مجازی]* موو لێ نەدان؛ کوت متی

یەک بوون ‹عین هم‌اند، با هم مو نمی‌زنند: هەر وەکوو یەک وان، کوت‌ومتی یەکن›.

**موها را در آسیاب سفید نکردن:** *[کنایی]* قژ لە ئاسیاودا سپی نەکردن؛ ڕیش بە بەلاش سپی نەبوون؛ بە هۆی تەمەنەوە زانا بوون.

**موی کسی را آتش زدن:** *[کنایی]* مووی کەسێ هەڵکزاندن/ هەڵپرووزاندن؛ لە کوت‌وپڕا و زۆر بەجێ لە شوێنێکدا پەیدا بوون ‹درست همان موقع سر رسید، مثل اینکه مویش را آتش زده باشند: هەر ڕاست لەو کاتەدا پەیدا بوو، دەتگوت موویان هەڵکزاندووە›.

**به مویی بند بودن:** *[کنایی]* بە پفێکەوە بەند بوون؛ بە موویەکەوە بەسران؛ بە تڕێ بەن بوون؛ لە پچڕان و تیاچووندا بوون ‹زندگیش به مویی بند است: ژیانی بە پفێکەوە بەندە›.

**یک مو از سر کسی کم نشدن** ☜ **یک[2]**

**موآخذه** / mo'āxeze ، ـها/: [عربی]/اسم. وەخواست؛ کاری لێ‌پرسینەوە؛ خواستنەوە؛ دانە بەر گیر و گاز ‹به خاطر آن اشتباهش موآخذه می‌شود: لەبەر ئەو هەڵەی کردوویە وەخواست دەکرێ›.

**موآنست** / mo'ānesat/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* هۆگرەتی؛ هاونشینی؛ دۆستایەتی.

**موات**/ mavāt/: [عربی] *صفت.* ١. *[نامتداول]* مردوو؛ مردگ ٢. ☜ زمین موات، **موات**

**مواثیق** / mavāsîq/: [عربی] جمعِ ☜ **میثاق**

**مواج** / mavvac/: [عربی] *صفت.* شەپۆلاوی؛ شەپۆلدار؛ بەپێل ‹دریای مواج: دەریای شەپۆلاوی›.

**مواجب** / mavaceb ، ـها/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* جیرە؛ مووچە و بەرات؛ مەواش؛ بژیوێ کە بە قوتابی و کارکەری دەوڵەت دەدرێ.

**مواجه** / movāceh/: [عربی] *صفت.* تووشیار؛ تووش‌هاتوو؛ تووش‌هاتگ.

◘ **مواجه شدن:** تووشیار بوون؛ ڕووبەڕوو بوون؛ تووش هاتن/ ئامای؛ ئاوڕیش بوون؛ بەرەو ڕوو بوونەوە؛ ڕووبار بوونەوە ‹با مشکلی مواجه شدیم: تووشی گرفتێک بووین›.

**مواجهه** / movācehe/: [عربی]/اسم. بەرەوڕوویی؛ ڕووبارکاری: ١. کار و ڕەوتی ڕووبەڕووکردنی دوو کەس بۆ دەرخستنی ڕاستییەک ٢. کار و ڕەوتی ڕووبەڕوو بوون؛ تووش هاتن.

**مواد** / mavād(d)/: [عربی] جمعِ ☜ **مادّه**

◘ **مواد مخدر:** ماکی سڕکەر؛ ئەو ماکانەی مرۆ تووشی نەشە، خەوالوویی و هۆکارەیی دەکەن: **مُخدّرات**

**موارد** / mavāred/: [عربی] جمعِ ☜ **مورد**

**مواریث** / mavārîs/: [عربی] جمعِ ☜ **میراث**

**موازات** / movāzāt/: [عربی]/اسم. هاوشانی؛ دۆخی شان‌بەشانی یەک بوون ‹جاده و رودخانەی زاب کوچک به موازات یکدیگرند: جادە و چەمی زابی گچکە هاوشانی یەکن›.

**موازنه** / movāzene/: [عربی]/اسم. هاوسەنگی؛ هاوقاتی ‹موازنەی قدرت: هاوسەنگی دەسەلات›.

**موازی** / movāzî/: [عربی] *صفت.* هاوشان: ١. لە یەک درێژەدا و شان‌بەشانی‌یەک ‹ دوخط موازی: دوو هێڵی هاوشان› ٢. *[مجازی]* بە یەک کار و ڕێگاوە ‹سازمان‌های موازی: ڕێکخراوەگەلی هاوشان›.

**موازین** / mavāzîn/: [عربی]/اسم. پێودان؛ پێودانک؛ سەنگ‌وکێش؛ سەنگەل؛ پێومان ‹موازین قانونی: پێودانی قانوونی›.

**مواشی** / mavāšî/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* وڵسات؛ مالات؛ پاتاڵ؛ گەلە؛ مەڕ و مالات؛ گا و گۆل.

**مواضع** / mavāze'/: [عربی] جمعِ ☜ **موضع**

**مواضعه** / movāze'e/: [عربی]/اسم. کەین‌وبەین؛ کاکەوبراله؛ کاری قەرار دانان بۆ بەڕێوە بردنی کارێک (زۆرتر ناڕەوا).

**مواظب** / movāzeb/: [عربی] *صفت.* وشیار؛ هۆشیار؛ سەخبیر؛ چاوێر؛ چاودێر؛ ئاگادار؛ هاگەدار ‹مواظب باش گربه گوشت را نخورد: وشیار بە پشیلە گۆشتەکە نەخوا›.

**مواظبــت** / movāzebat ، ـهــا/: [عربــی]/اســم. ئاگــاداری؛ ئەڵــڕدی: ١. کــەتوانی؛ چــاوێری؛ چــاوەدێری ‹از خانــه مواظبــت مــی‌کــرد: ئاگــاداری ماڵــەکەی دەکــرد› ٢. پەرســتاری ‹بایــد از بچــه مواظبت کنم: دەبێ ئاگاداری لە منداڵەکە بکەم›.

**مواعظ** / mavā'ez/: [عربی] جمعِ ☜ **موعظه**

**مواعید** / mavā'îd/: [عربی] جمعِ ☜ **وَعده**

**موافق** / movāfeq/: [عربی] صفت. ڕازی؛ قایـل: ١. ساز؛ تەبا ‹او با همەچیز موافق بود: ئەو بە هــەموو شتێک تەبا بوو› ٢. /ـها؛ ـان؛ ـین/ هاودەنـگ ‹بـا رفتن من موافق بود: بە ڕۆشتنم ڕازی بوو›.

**موافقــت** / movāfeqat ، ـهــا/: [عربــی]/اســم. ١. سازگاری؛ پێکهاتوویی؛ تـەبایی ٢. هـاوڕێیی ٣. هاوبیری؛ هاودەنگی؛ دۆخی هاودەنگ بـوون ‹در این نظر با هم موافقت داشتیم: لەم بارەوە پێکــەوە هاودەنگ بووین›.

**موافقتنامــه** / movāfeqatnāme ، ـهــا/: [عربــی/ فارسی]/اسم. ڕێکەوتنامە؛ بەڵگەیەکی ڕەسمی لـە سەر پێکهاتنی دوو یان چـەن لایـەن لـە سـەر شتێک.

**مواقع** / mavāqe'/: [عربی] جمعِ ☜ **موقع**

**موالید** / mavālîd/: [عربی] جمعِ ☜ **مولود**

**موانع** / mavāne'/: [عربی] جمعِ ☜ **مانع**

**مواهب** / mavāheb/: [عربی] جمعِ ☜ **موهبت**

**موئین** / mû'în/ ☜ **موبین**

**موبایل** / mobāyl/: [انگلیسی] ☜ تلفـن همـراه، **تلفن؛ مُبایل**

**موبد** / mûbad, mûbed ، ـها؛ ـان/: اسم. موبـد؛ مۆبەد؛ گەورەی ئایینی زەردەشت.

**موبر** / mûbar/: اسم. موولابـەر؛ مووبـەر ‹داروی موبر: دەرمانی مووڵابەر›.

**موبه مو** / mûbemû/: قید. [مجازی] سـەرلەبـەر؛ مووبـەموو؛ بـە وردی (لەمـەڕ خەبـەر و باسـەوە) ‹نشست و همه چیز را موبه‌مو تعریف کـرد: دانیشـت و هەموو شتێکی سەرلەبەر گێڕاوە›.

**موت** / mowt, mo:t/: [عربی]/اسم. [ادبی] مـەرگ ‹بیچـاره رو بـه مـوت اسـت: بەسـتەزمان لـە سـەرە مەرگە›.

**موتاســیون** / motās(i)yon/: [فرانســوی]/اســم. [زیستشناسـی] چرتـک؛ بـاز؛ موتاسـیۆن؛ ڕەوتی گـۆڕانی کـوتوپـڕی پێکهاتـەی ژینـەوەرێک و سەرهەڵدانی جۆرێکی تازە لەو گیاندارە.

**مؤتلـف** / mo'talef/: [عربـی] صفت. یـەکگرتوو: ١. /ـان؛ ـین/ پێکەوەسازاو ٢. هاوپەیمان: **مؤتلفه**

**مؤتلفه** / mo'talefe/: [عربی] ☜ **مؤتلف**

**مؤتمن** / mo'taman/: [عربی] صفت. [ادبی] ڕاست؛ دروست؛ دروستکار و جێ متمانە.

**موتـور** / motor ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. موتـور: ١. بەشێک لە ماشین کە هێزی جووڵە بەرهـەم دێنـێ: (الـف) بەشـێکی وا لــە ترۆمبیلـــدا ب) ئەلکترۆموتور ج) پومپی ئاو ٢. موتورسیکلێت.

▣ **موتور درونسوز**: جۆرێ موتور کە تەقینەوەی سووتەمەنی لە نێو سیلەندردا دەبێتە هـۆی بەدیهاتنی تینێکـی زۆر و ئـەو تینـە دەبێتـە هێزی میکانیکی بۆ بەڕێوە بردنی ماشین.

**موتورخانه** / motorxane ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] /اسم. موتورخانە؛ ماڵ یـان دیوێـک بـۆ دەزگـای بەرهەمهێنی کارەبا، وزە یان گەرما.

**موتورسوار** / motorsavār ، ـها؛ ـان/: [فرانسـوی/ فارسـی]/اسم. موتورسـوار؛ کەسـێ کــە سـواری موتورسیکلێت دەبێت.

**موتورسیکلت** / motorsîklet ، ـها/: [از فرانسـوی] /اسم. موتورسیکلێت؛ کەرستەی گواستنەوەی دوو چەرخ بـۆ یـەک یـان دوو سەرنشـین، بـڕێکیان سێ‌چەرخە و هەیەتی هۆدەیەکیشیان لەگەڵدایە.

**موتوری**[1] / motorî ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [گفتاری] موتورسوار.

**موتوری**[2]: صفت. موتوری: ١. دارای موتور ‹قایق موتوری: لۆتکـەی موتـوری› ٢. دارای کەرسـتەی گواستنەوەی موتوری ‹گُردان موتـوری: گـوردانی

موتوری›: **موتوریزه**

**موتوریزه/ motorîze/:** [فرانسوی] ☜ **موتوری-۲**

**مؤثر / mo'asser/:** [عربی] *صفت.* کارکۆ؛ کاریگەر؛ کارتێکەر؛ کارلێکەر ‹حرف مؤثر: قسەی کارکۆ›.

▣ **مؤثر بودن:** کاریگەر بوون؛ کارتێکەر بوون؛ کارلێکەر بوون ‹حرفهایم مؤثر بود و دعوا خاتمه یافت: قسەکانم کاریگەر بوون و شەڕ دوایی هات›.

**مؤثر واقع شدن:** کارکۆ بوون؛ کارکردن ‹پادرمیانی مؤثر واقع شد: ناوبژیوانی کارکۆ بوو›.

**موثق / movassaq/:** [عربی] *صفت.* جێبڕوا؛ بڕواپێکراو؛ جێمتمانە ‹خبر موثق: هەواڵی جێبڕوا›.

**موج / mowc, mo:c** ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ۱. /امواج/ شەپۆل؛ شەپێل؛ شیپە؛ شیپەل؛ سیپەل؛ لیپ؛ لیپاو؛ لەف؛ پەل؛ مۆنج: *الف)* بۆڕ؛ پێل؛ کۆما ئاوی بەرزەوە بووی بزۆک ‹موج دریا: شەپۆلی دەریا› *ب)* نژمێک لە کەوانەگەلی یەک لە سەر یەک و وەکیەک ‹موج رادیویی: شەپۆلی ڕادیۆیی› ۲. /امواج/ */مجازی/* شەپۆل؛ دۆخی هەڵکفان و یاخی بوونی هەستەکانی دەروون ‹موج خشم: شەپۆلی تووڕەیی› ۳. /امواج/ شەپۆل؛ تەوژمی خێرا و کوتوپڕی ‹موج هوای گرم؛ موج پناهندگان: شەپۆلی گەرما؛ شەپۆلی پەنابەران› ٤. /امواج/ */فیزیک/* شەپۆل؛ جۆرێک شڵەژاوی یان گۆڕانکاری کە وزە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ڕادەگوێزێت ٥. مەوج؛ تەنراوێکی لە خوری، نوێنی تێوە دەپێچن.

▣ **موج الکترومغناطیسی:** شەپۆلی ئێلکترۆمیگناتیسی؛ شەپۆلێکی تێکەڵاو لە مەیدانی کارەبایی و میگناتیسی کە بە خێرایی تیشک دەڕوات.

**موج انفجار:** شەپۆلی تەقینەوە؛ هەوای تەقینەوە؛ شەپۆلی بەهێزی هەوا کە لە تەقینەوەدا بەدی دێت.

**موج بلند:** شەپۆلی بەرز؛ شەپۆلی ئێلکترۆمیگناتیسی بەرزتر لە شەپۆلی ڕادیۆیی (٥٤٥ متر یان ژێر ٥٥٠ کیلۆهرتس).

**موج حامل:** شەپۆلی ڕاگوێز؛ شەپۆلی یەک لە سەر یەکی ئێلکترۆمیگناتیسی کە لە لایەن نێنەرە ڕادیۆییەکانەوە بڵاو دەبێتەوە.

**موج رادیویی:** شەپۆلی ڕادیۆیی؛ شەپۆلی ئێلکترۆمیگناتیسی بە فرکانس ۱۰ کیلۆهرتس تا ۳۰۰۰۰ میگاهرتس.

**موج زمین‌لرزه:** شەپۆلی بوومەلەرزە؛ لەرەی توێکڵی زەوی بە هۆی بوومەلەرزەوە.

**موج کوتاه:** شەپۆلی کورت؛ شەپۆلی ڕادیۆیی لە نێوان ۱۵ تا ۲۰۰ میتر، بۆ بڵاوکردنەوەی بەرنامەی ڕادیۆ لە دوورەوە (**SW**).

**موج متوسط:** شەپۆلی ناونجی/ مامناوەندی؛ شەپۆلی ڕادیۆیی لە نێوان ۲۰۰ تا ۱۰۰۰ میترەوە، بۆ بڵاوکردنەوەی بەرنامەی ڕادیۆ لە نزیکەوە (**MW**).

**موج نو:** شەپۆلی نوێ؛ بزاڤێکی نوێ لە فیلمسازیدا.

▣ **موج برداشتن:** ۱. شەپۆل دان؛ شەپۆل وەشاندن؛ لێپل بوون؛ چکوورین؛ بەدیهاتنی شەپۆل ‹با وزش نسیم آب موج برمی‌داشت: بە شنەی با ئاوەکە شەپۆلی دەدا›: **موج زدن** ۲. لۆچ بوون؛ چرچ هەڵگرتن.

**موج زدن:** ۱. ☜ **موج برداشتن** ۲. کەروێشکەکردن؛ شەپۆل دانی کۆمایەکی چڕ و پڕ (وەک مەزرای گەنمی گوڵکردوو کاتێ با لێی دەدا) ۳. */مجازی/* شەپۆل دان؛ کەوتنە جووڵەی شتێک بە لێشاو ‹شادی در چشمانش موج می‌زد: شادمانی لە چاوانیدا شەپۆلی دەدا›.

**موجب / mowceb, mo:ceb, mûceb** ، ـها؛ ـات/: [عربی]/*اسم.* هۆ؛ سۆنگە: ۱. سەبەب ‹چه چیز موجب این فاجعه بوده است؟: چ شتێک بۆتە هۆی ئەم کارەساتە؟› ۲. ئەوەی کارێک پێویست دەکا ‹بە

موجب قانون: به هۆی قانوون›.

◘ به موجب قانون: به هۆی قانوون؛ به گوێرەی ئەوەی قانوون به پێویستی زانیوه.

**موجد** / mûced ، ـین/: [عربی]/اسم. ئافرێنەر؛ بەدیهێنەر؛ بەدیهێن.

**موجدار** / mowcdār, mo:c- /: [عربی/ فارسی] صفت. چیندار؛ مۆنجدار؛ مۆنج ـ مۆنج؛ به بەرز و نزمی وەک یەک و هاوشانەوه ‹سطح موجدار: ڕووبەری چیندار›.

**موجر** / mûcer ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. بەکرێدەر؛ ئەوەی ملکێ به کرێ دەدا.

**موجز** / mûcez /: [عربی] صفت. کورت؛ کۆتا ‹بۆ قسه و باس دەگوترێ›.

**موجسواری** / mowcsavarî, mo:c- /: [عربی/ فارسی]/اسم. پێل‌سواری؛ جۆره وەرزشێکی نێو ئاو که له سەر پەڕەیەکی درێژ و باریک (له چێو یان فایبرگلاس) ڕادەوەستن و به سەر شەپۆلی ئاودا دەڕوون.

**موجشکن** / mowcšekan, mo:c- ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. کەڵەره؛ پێل‌شکێن؛ شەپۆل‌ڕەوێن؛ دیوارەی کنارێنی دەریا بۆ بەرگری له تەوژمی شەپۆل.

**موجنگار** / mowcnegār, mo:c- ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. پێل‌پێو؛ شەپۆل‌پێو؛ کەرستەی تۆمار کردنی بزاو و تەوژم به شێوەی پێل لەسەر کاغەز. هەروەها: **موجنگاری**

**موجود**[1] / mowcûd, mo:cûd ، ـها؛ ـات /: [عربی] /اسم. بوونەوەر ‹موجود بی‌جان: بوونەوەری بێ‌گیان›.

◘ موجود زنده: گیانەوەر؛ گیانلەبەر؛ بوونەوەری زیندوو.

**موجود**[2]: صفت. ۱. هەبوو؛ خاوەنی بوون ۲. ئامادە؛ بەرهەف؛ له بەر دەست؛ له هەوێڵ.

**موجودات** / mowcûdāt /: جمعِ ☜ **موجود**

**موجودی** / mowcûdî, mo:cûdî ، ـها/: [عربی] /اسم. ئاشتەبا؛ ئەو بەشه له پاره یان شت که له شوێنێکدایه یا هی کەسێکه.

**موجودیت** / mowcûdîyyat, mo:cûdîyyat /: [عربی]/اسم. دۆخی بوون؛ هەبوون ‹با این کار موجودیت شرکت به خطر می‌افتد: بەم کاره بوونی بەشدارگه دەکەوێته بەر مەترسی›.

**موجه** / movaccah /: [عربی] صفت. ۱. جێ‌کەوتوو؛ گونجاو ۲. تێگەیشتوو؛ شیاو؛ حاڵی ‹آدم موجهی است: کەسێکی تێگەیشتووه›.

**موجی** / mowcî, mo:cî /: [عربی] صفت. ۱. پێل‌ئاسا؛ شەپۆلی ‹حرکت موجی: بزووتنی شەپۆلی› ۲. *[گفتاری]* مەوجی؛ وەبەر شەپۆلی تەقینەوه کەوتوو ۳. *[کنایی]* هێندێک لێواو.

**موچ** / mûč /: صوت. مۆچ؛ مووچ؛ دەنگی ماچ.

◘ موچ کشیدن: مۆچ کێشان/ لێدان؛ به دەم و لێو هێنانه یەک و ملکەملک کردن دەنگێک وەک دەنگی ماچ دەرهێنان: *الف)* بۆ سەرنج ڕاکێشانی منداڵان *ب)* بۆ بانگ کردنی پەلەوەری کەوی (وەک کۆتر).

**موچول** / mučûl, močûl /: صفت. *[گفتاری]* جوانکیله؛ خونجیلانه؛ بووچکەلانه؛ بچکۆلانه؛ گچکۆله؛ بیچکەلانه؛ ژیکەلانه؛ چکۆله و جوان: **مچول**

**موچین** / mûčîn ، ـها/: اسم. مووچن؛ مووچینک؛ مچینک؛ میکه؛ مووکێش؛ ئامرازی موو هەڵکێشان: **موچینه**

**موچینه** / mûčîne / ☜ **موچین**

**موحد** / movahhed ، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. تاکەپەرەست؛ یەک‌پەرست؛ تەنیاناس؛ خاوەن بڕوا به تاکانەیی خودا.

**موحش** / mûheš /: [عربی] صفت. ترسناک؛ سامناک؛ زراوبەر؛ زاڵەتۆقێن.

**مؤخر** / mo'axxar, mo'axxer ، ـان؛ ـین/: [عربی] صفت. ئاخری؛ دوایی؛ دمایین. بەرانبەر: **مقدّم**

**مؤخره** / mo'axxare, mo'axxere ، ـها/: [عربی] /اسم. پاشکۆ؛ پاشەڵ؛ پاشەکی؛ ئەوەی له ئاخرەوه

بـیّ، وەک بەشـی کۆتـایی نووسـراوەیەک.
بەرانبەر: **مقدّمه**

**موخـــوره** / mûxore/: /اسـم. مووخـــۆرە؛ نەخۆشینێکی موو، بەتایبەت مـووی سـەرە کـە تورت و دوولقان دەبێتەوە و لە دوایی‌دا دەشکێ.

**مؤدب** / mo'addab ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت.* بە ئەدەب؛ بە هەڵس‌وکەوت.

**مؤدبانه** [1] / mo'addabāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بـە ئەدەبـەوە ‹رفتـار مؤدبانـه: جووڵانـەوەی بـە ئەدەبەوە›.

**مؤدبانه** [2]: *قید.* بە ئەدەبەوە ‹مؤدبانه رفتار می‌کـرد: بە ئەدەبەوە دەجووڵایەوە›.

**مـودت** / mavaddat, maveddat ، ـهـا/: [عربـی] */اسم.* دۆستی؛ برادەری.

**مودم** / modem/: [انگلیسی] ☜ **مُدِم**

**مؤدی** / mo'addî ، ـها؛ ـان/: [عربی]*/اسم.* پێـدەر؛ بدەر (بەتایبەت بۆ پیتاکی دەوڵەتی).

▣ **مؤدی مالیات:** پیتاکدەر.

**مودی** / mûdi/: *صفت.* دەمـدەمی؛ حولحـولی؛ حولحولی مەزاج؛ عەنتەر مەزاج؛ هـەر تـاوێ لـە سەر بارێ.

**مؤذن** / mo'azzen ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی]*/اسـم.* بانگـدەر؛ بـانگویژ؛ بـانگبێژ؛ ئـەوی بانگـدانی مزگەوتێکی لە ئەستۆدایە.

**مـــوذی** / mûzi/: [عربـی] *صـفت.* ۱. ئـازاردەر؛ گەهرێنـەر ‹صـدای مـوذی: دەنگـی ئـازاردەر› ۲. زیاندەر؛ زیانەخرۆ؛ زیانی خورۆ ‹حیوان موذی: جانەوەری زیانـدەر› ۳. *[مجـازی]* تـووش؛ قـاپگر؛ مافەتا؛ مافەتە؛ ئیار؛ بەدفەڕ و فێڵباز ‹خیلی موذی است: زۆر تووشە›.

**موذیانـه** [1] / mûziyāne/: [عربـی/ فارسـی] *صـفت.* ئـازاردەر؛ گەهرێنـەر ‹نقشـەی موذیانـە: پـیلانی ئازاردەر›.

**موذیانه** [2]: *قیـد.* فێڵـەبازانە؛ زۆڵانـە؛ بـە زۆڵـیەوە؛ مشـکانە ‹موذیانـە مـی‌خواسـت پولهـا را بـالا بکشـد: فیلەبازانە دەیویست پارەکە بخاتە لای خۆیەوە›.

**موذیگری** / mûzîgarî ، ـها/: [عربی/ فارسی]*/اسـم.* ڕێوی‌بازی؛ زۆڵبازی؛ فێڵبازی؛ پێچی و ناڕاستی.

**مور** / mûr ، ـها؛ ـان/: */اسم. [ادبی]* مێرووله؛ مێـروو؛ مێرو؛ مێری؛ مێلوورە؛ مرۆچە.

**مـورب** / movarrab/: [عربـی] *صـفت.* لار؛ گێـڕ؛ کەج؛ مارودوو؛ چەفت؛ خێچ؛ لار و خوار؛ خـوار؛ قیلـەوقاچ؛ شـەوتوور؛ شـەفتوور؛ شـەفتوول؛ دۆلکان.

**مـورث** / mowres, mo:res/: [عربـی]*/اسم.* هـۆ؛ سەبەب ‹این خبر مورث نگرانی گردیـد: ئـەم هەواڵـە بووبە هۆی دڵمەندی›.

**مورچـــال** / mûrčāl ، ـهـا/: */اسـم.* کـز؛ شـار؛ شـارەمێروو؛ شـارەمرووله؛ شـارەمێرووله؛ شارەمێرو؛ شارەمرۆچە؛ مێروستان؛ مرۆچەلیانی؛ مەریژلوو؛ شانەمەلوورە.

**مورچه** / mûrče ، ـها؛ ـگان/: */اسم.* مێرووله؛ مێـرۆ؛ مێـروو؛ مـیروو؛ مۆریلـە؛ مێللـوورە؛ مێلـوورە؛ مێلـوورە؛ مـووری؛ مـۆری؛ مرۆچـە؛ مرووچـە؛ مێرووچـە؛ مریچـە؛ مرۆچلـە؛ ملۆچکـە؛ مژلـۆر؛ مژلۆک؛ مژلەور؛ مەلوورە؛ مێـری؛ مـرووژ؛ مریـژ؛ مەریژ؛ مۆژله؛ مۆژلا؛ مروژە؛ مروویژ؛ موور؛ ملۆرە؛ مـۆجلا؛ مۆجلـە؛ مۆرجـەلا؛ مـۆرجلا؛ مـۆرزەلا؛ مجلەوەر؛ مەرژوەل؛ گێرک؛ تیرەیەکی گەورە لە مێرووانی ناسکباڵ بە لەشی سێ‌بەشـی: سـەر، سینە و زگەوە، لە ئەندازەی ۲ تا ۱۸ میلی‌میتردا و بە ڕەنگی زەرد، سوور، قاوەیی و ڕەشـەوە کـە بە کۆمەڵ دەژین.

**مورچـەخـــوار** / mûrčexār ، ـهـا؛ ـان/: */اسـم.* ئاژەڵـێکی مێرووخـۆرە بـە زمـانێکی درێـژ و نووسنەکەوە.

**مورخ** / movarrax/: [عربی] *صفت.* بـەڕێکـەوت؛ تاریخدار ‹نامەی مورخ ۸۷/۷/۱۰ شما رسید: نامـەی بەڕیکەوتـی ۸۷/۷/۱۰ی ئێوە گەیشت›: **مورخه**

**مورخ** / movarrex ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی]*/اسم.*

١. مێژوونووس ٢. مێژووناس؛ مێژووزان.

**مورخه** / movarraxe/: [عربی] ☜ **مُورَّخ**

**مورد** / mowred, mo:red, mûred/، ـها/: [عربی] /اسم. ١. /مَوارد/ بابەت؛ دۆخێ کە لە ئارادایە ٢. /مَوارد/ بار؛ بار و دۆخ ‹در این مورد به کمک شما نیازمندیم: لەم بارەوە ئاتاجی یارمەتی ئێوەین› ٣. جێ؛ جێگە؛ دۆخێ کە پێویستی بە پێراگەیشتنە ‹اعتراض شما مورد نداشت: بەرتەکی ئێوە جێی نەبوو› ٤. درگە؛ هەیبەر؛ مژاد؛ درخە؛ کرۆک؛ شتی بەر ئاماژە ‹مورد از خانه خارج شد: درگە لە ماڵ دەرکەوت›.

◘ **مورد اجاره**: بەکرێ گیراو/ دراو؛ ئەوی لە بایی پارەیەکدا بە کرێگیراوە یان دراوە.

**مورد اشاره**: هەیبەر؛ درگە؛ مژاد؛ درخە؛ کرۆک؛ ئەوەی ئاماژەی پێ کراوە.

**مورد** / mûrd/، ـها/: [از کردی] /اسم. کەیبر؛ کەیرە؛ مۆرد؛ مۆرتک؛ موورد؛ مووتک؛ موورتک؛ میتگ؛ دەوەنێکی گچکە بە گەڵای سەوز و بۆنخۆشەوە کە گوڵی سپی دەر دەکا و بەرەکەی بە قەد نۆکێکە و بۆ دەرمان ئەشێ.

◘ **مورد سبز**: جۆرێک مۆردی ڕازاوە بە گوڵی سپی و دوچکە گوڵی درێژەوە: **آس**

**موردپژوهی** / mowredpajûhî, mo:red-, mûred-/: [عربی/ فارسی] /اسم. تۆژینەوە لەمەڕ بابەتێکی دیاریکراوی تایبەتی.

**مورددار** / mowred.dār, mo:red-, mûred-/: [عربی/ فارسی] صفت. [مجازی] شوێنپیس؛ شوێنچەپەڵ؛ بە ڕابردوویەکی خراپەوە.

**مورس** / mors/: [انگلیسی] ☜ **مُرس**

**مورفولژی** / morfolojî/: [فرانسوی] ☜ **ریختشناسی**

**مورفین** / morfîn/: [فرانسوی] ☜ **مُرفین**

**مورـ مور** / mûrmûr/: /اسم. مرۆچانە؛ مرۆژانە؛ مرووژانە؛ گزـگز؛ ملۆچە؛ مرۆچلێ؛ ئاژاشکە؛ هەستێکی وەک ئەوەی ڕۆیشتنی مێرووڵە بە سەر پێستدا بەدی دێنێ و دەکرێ بە هۆی سەرما، ترس یان نەخۆشیەوە بێ.

◘ **مور ـ مور شدن**: گزگزین؛ مرۆژانە/ مرۆچانە کردن؛ مرۆچلێ کەردەی.

**موروث** / mowrûs, mo:rûs/: [عربی] صفت. میراتی؛ کەلەپووری؛ بە میراتبراو.

**موروثی** / mowrûsî, mo:rûsî/: [عربی] صفت. میراتی؛ بە میرات گەییو؛ لە میراتهاتوو.

**موریانه** / mûryāne/، ـها/: /اسم. گەزووز؛ مۆرانە؛ مۆریانە؛ موران؛ مۆرکە؛ مۆرەکە؛ مەریکانە؛ مرک؛ مۆرەقە؛ مخورکە؛ لێوەنگ؛ سوڕک؛ سورک؛ مێروویەکی کۆمەڵژی ئافەتی چێوە.

**موز** / mowz, mo:z/، ـها/: /اسم. مۆز؛ مەوز: ١. دار یان دەوەنی گەرمەسێری بە میوەی گۆشتنی خۆراکیەوە ٢. میوەی ئەو دارە کە درێژ و باریک و گۆشتنە و تژی لە ماکی قەندیە.

**موزائیک** / mûzā'îk/: [فرانسوی] ☜ **موزاییک**

**موزائیکی** / mûzā'îkî/: [فرانسوی] ☜ **موزاییکی**

**موزاییک** / mûzā(y)îk/: [فرانسوی] /اسم. موزاییک؛ مووزاییک؛ مزاییکە؛ بەردێکی دەستکرد لە سیمان و ڕیخی ڕەنگامە بۆ فەرشکردنی ڕووبەر: **موزائیک**

◘ **موزاییک کردن**: مووزاییککردن؛ پۆشینی ڕووبەرێ بە موزاییک ‹دادم کف حیاط را موزاییک کردند: دام تەختی حەوشەکەیان مووزاییک کرد›.

هەروەها: **موزاییک شدن**

**موزاییکی** / mûzā(y)îkî/: [فرانسوی] صفت. موزاییکی: ١. لە جنسی موزاییک ٢. بە ڕواڵەت یان بیچمێکی وەکوو مووزاییک * **موزائیکی**

**موزدا** / mûzedā/، ـها/: /اسم. مووبەر؛ موولابەر؛ مووسڕ؛ مووخۆر؛ دەرمانی کیمیاوی بۆ لابردن و سڕینەوەی موو.

**موزدایی** / mûzedāyî/: /اسم. موولابەری؛ کاری سڕینەوەی موو لە لەش.

**موزع** / movazze'/، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] /اسم.

بلاوکەرەوە؛ دابەشکەر؛ کەسێ کە شتێ (بەتایبەت چاپەمەنی) بڵاو دەکاتەوە.

**مـوزون** / mowzûn, mo:zûm/: [عربی] *صفت.* ئاهەنگین: ۱. نەرم و لەبار؛ جوان و خوشیک ‹با گامهای موزون راه می‌رفت: بە هەنگاوی ئاهەنگین دەڕۆیشت› ۲. بە ئاهەنگ؛ ئاهەنگدار *الف)* بە کێشی عەرووزیەوە (بۆ شیعر) *ب)* بە هەوای مووسیقاییەوە (بۆ ئاهەنگ).

**مـوزه** / mûze ، ـها:/ *اسم.* [فرانسوی] مووزە؛ ئەنتیکەخانە؛ جێگای ڕاگرتن، پاراستن و ڕانانی شتی زۆر بەنرخ و کەونار.

**موزه‌دار** / mûzedār ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* مووزەدار؛ ئەنتیکەوان.

**موزی** / mowzî, mo:zî/: *صفت.* مۆزی؛ مەوزی؛ مۆزینە؛ پێکهاتوو لە مۆز یان بۆنی مەوز ‹بستنی موزی: بەستەنی مۆزی›.

**موزیسین** / mûzîs(i)yan ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ۱. مووسیقارِ؛ مۆسیقارِ؛ مۆسیقازان؛ زانیاری مووسیقا ۲. ژەنیار.

**موزیـک** / mûzîk/: [فرانسوی] *اسم.* مووزیک؛ مووسیقا؛ مۆسیقا.

**موزیکـال** / mûzîkāl/: [فرانسوی] *صفت.* مووسیقایی؛ مۆسیقایی؛ مووسیقادار ‹نمایش موزیکال: شانۆکی مووسیقایی›.

**موسـتان** / movestān ، ـها/: *اسم.* مێوسان؛ مەوستا؛ مەوسان؛ باخە مێو؛ تاکستان.

**مؤسس** / mo'asses ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* دامەزرێنەر؛ دامەرزێنەر؛ ئەرەمەرزنەر؛ بنیاتنەر.

**مؤسسـات** / mo'assesāt/: [عربی] جمعِ ☜ **مؤسسه**

**مؤسسه** / mo'assese ، ـها؛ مؤسسات/: [عربی] *اسم.* ڕێخراوە؛ ڕێکخراوە؛ دامەزراوە؛ دەزگە؛ شوێنێک بۆ کار، وێڕای دەم و دەزگا و هاوکار و... ‹مؤسسەی آموزشی: ڕێخراوەی فێرکاری›.

◙ **مؤسسەی انتفاعی**: ڕێخراوەی بەهرەوەری؛ دامەزراوەی بۆ قازانج. هەروەها: **مؤسسەی غیرانتفاعی**

مؤسسەی خیریە: مەزرینگەی خێرات؛ دامەزراوەی بۆ کاری خێر.

**موسلین** / mûselîn/: [فرانسوی] *اسم.* مسلین؛ پارچەی نەرم و سپی لە پەموو بۆ مەلافە و جلوبەرگی هاوینان.

**موسم** / mowsem, mo:sem, mûsem/: [عربی] *اسم.* وەرز؛ جەنگە؛ هەرِەت؛ هەرِەمە؛ تۆف؛ کژ؛ هنگ؛ وەخت؛ وەگ؛ کات؛ دۆخیان؛ گۆنەر ‹موسم باران؛ موسم جوانی: وەرزی باران؛ هەرەتی لاوی›.

**مـوس ـــ مـوس** / musmus/: *اسم.* *[گفتاری]* ماستاوکەری؛ پیازپاککەری؛ شاڵووزی؛ زمانلووسی.

**موسـمی** / mowsemî, mo:semî, mûsemî/: [عربی] *صفت.* وەرزی؛ کژی؛ وەختی؛ کاتی؛ وەرزینە؛ کژینە: ۱. سەر بە کاتێکی تایبەت ‹غذای موسمی: خواردنی وەرزی› ۲. سەرهەڵدەر لە کاتێکی تایبەتدا ‹باران موسمی: بارانی وەرزی›.

**موسـوم** / mowsûm, mo:sûm/: [عربی] *صفت.* ۱. ناڤدێر؛ ناونراو ‹از آن پس به ایران موسوم شد: لەو کاتەوە بەدوا بە ئێران ناڤدێر کرا› ۲. بە ناو؛ ناسراو ‹شخصی موسوم به آرام: کەسێک بە ناوی ئارام›.

◙ موسوم شدن: ناو نران؛ ناڤدێر بوون.

**موسوی** / mûsavî/: [عربی] *صفت.* مووسەوی: ۱. مووسایی؛ جوو؛ جوولەکە؛ سەر بە حەزرەتی مووسا(س) ۲. سەر بە ئیمامی حەوتەمی شیعە، مووسای کوڕی جەعفەر.

**موسیر** / mûsîr ، ـها/: *اسم.* مووسڵی؛ مووسیر؛ سیرۆکە؛ سیرۆک؛ سیرەعەجەمە؛ زیسک؛ زیزک؛ زیل: ۱. بنەگیایەکی پایایە بە ساقەتەی گرۆڤەر، گەڵای درێژ و باریک و گوڵی بنەوشی هۆشاڵۆوە، پیوازەکەی دەخورێ ۲. پیوازی ئەو گیایە کە درشت و تۆکمەیە و لە ماست و

ترشیاتی دەکەن

**موسیقائی** / mûsîqā'î/: [معرب از یونانی] ☜ **موسیقایی**

**موسیقایی** / mûsîqāyî/: [معرب] *صفت.* مۆسیقایی؛ مووسیقایی؛ سەر بە مووسیقا: **موسیقائی**

**موسیقی** / mûsîqî/: [معرب]*اسم.* مووسیقا؛ مۆسیقا؛ موورزیک؛ مۆزیک: ١. هونەری لە پاڵ‌یەک نانی دەنگ بە لەبەرچاوگرتنی ڕیتم و میلۆدی و هارمۆنی ٢. ئەو هەوایە کە بەم شێوە بەدی دێ.

◘ موسیقی پاپ: مووسیقای پاپ؛ پارچە مووسیقای هۆنراو بۆ خەڵکی ئاسایی، بەبێ ڕەچاوکردنی بنەمای مووسیقایی.

موسیقی جاز: مووسیقای جاز؛ مووسیقای ڕەش‌پێستەکانی ئەمریکا کە ئێستاکە جەهانیە.

موسیقی سمفونیک: ١. مووسیقای سەمفونیک؛ مووسیقای کۆمژەن؛ مووسیقای سازی درێژخایەن لە چوار بەشدا کە لە لایەن ئۆرکیستری تەواوەوە دەژەنرێ ٢. ☜ **موسیقی کلاسیک**

موسیقی سنتی: مووسیقای دابی: ١. مووسیقای هۆز یا نەتەوەیێ کە لە مێژەوە باو بووە ٢. ئاهەنگ یان گۆرانیەک کە دەنێو دەزگاکانی تایبەتی مۆسیقای ئێرانیدا هۆنرابێتەوە

موسیقی ضربی: مۆسیقایەک بە کێش و هەوای دیاریکراوەوە

موسیقی کلاسیک: موسیقای کلاسیک؛ جۆرێک مووسیقای شوێنکەوتووی مۆسیقازانانی گەورەی ڕابردوو، بەتایبەت بەرهەمەکانی سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەمی ئورووپا: **موسیقی سمفُنیک ـ٢**

موسیقی مجلسی: مووسیقای تایبەت بە کۆڕ و میوانی

موسیقی محلی: مۆسیقای ناوچەیی/ خۆماڵی؛ مووسیقای باوی ناو خەڵک کە بە سەر زارەوە هاتووە و پارێزراوە

موسیقی مذهبی: موسیقای ئایینی؛ ئاهەنگ و گۆرانی تایبەت بۆ ڕێورەسمی ئایینی

**موسیقیدان** / mûsîqîdān ، ـها؛ ـان/: [معرب/ فارسی]*اسم.* مووسیقار؛ مۆسیقار؛ مووسیقازان: ١. کەسی ئاگا لە بنەما و ڕێوشوێنی مووسیقا ٢. ئاهەنگساز ٣. ژەنیار.

**موسیو** / mos(i)yo/: [فرانسوی] ☜ **مُسیُو**

**موش** / mûš/: *اسم.* مشک؛ ملە؛ مەڕە؛ مل؛ مووش؛ میش؛ مسک؛ موێش؛ موویش: ١. *ـها/* گیاندارێکی گوانداری بچووک، بە قەپۆز و کلکی درێژەوە کە ڕەش، بۆر و سپی هەیە ٢. یەکەم ساڵ لە ساڵپێوی تورکستانی ☜ **تقویم**

◘ موش خانگی: مشکی ماڵی؛ مشکی بچووکی نێوماڵ کە ئافەتی دەغڵ و دانە و بە هەموو دنیادا بڵاوە.

موش صحرایی: ملە؛ سێقلە؛ قلەهەردی؛ کۆسینگ؛ مشکی دەشتی؛ مشکی زەردی مەیلەو قاوەیی کە لە دەشت و مەزرادا دەژی

موش کور: مشکە کوێرە؛ مووشۆ کۆر؛ جرجە مشک؛ هەرسیک؛ هەرمووشک؛ مشکەکۆرە؛ کەرەکۆر؛ ستێڤلۆک؛ جرج؛ خلت؛ جەرد؛ هەرمووسک؛ مشکێکی مل‌کورتی کلک‌کولە، گوێ و کەپۆی زۆر تیژە و کاژێک سەرچاوی داپۆشیوە

موش مُشک: مشکی ئاوی پوولەکەدار کە لە خۆیەوە ماکێکی بۆنخۆش دەردەدا

◘ موش دواندن: *[کنایی]* دەستەچیلە وەبن دان؛ ئاوری دێزە خۆش‌کردن؛ ئاگر/ دار پێوە نان؛ شێوانشێوکردن.

**موش‌خرما** / mûšxormā ، ـها/: *اسم.* خورماپێچان؛ مشکی خورما؛ مشکێکی تووک

زبره به گوێی زۆر کوڵ و کلکی تووکنەوە.

**موشک** / mûšak ، ـها/: *اسم.* هاژەک؛ مووشـەک؛ وژەک؛ قیژەک؛ فیشەکەشێتە: ۱. کەرستەیەک بـە خەزێنـەی سـووتەمەنیەوە کـە گازەکـەی دەردەچێ و بەرەو پێشی دەبا ۲. کەرسـتەیەکی وا بۆ چەکی گەرم.

**موشـکافی** / mûšekāfî ، ـهـا/: *اسـم. [مجـازی]* کولکومووش؛ وردبینی؛ سەرنجی وردبینانە لـە کاردا ‹مایل بود موضوع را موشکافی کند و به انگیزەی آن پی‌ببرد: دەیویست بابەتەکە کولکومووش بکا و لە هۆکارەکەی تێبگا›. هەروەها: **موشکاف**

**موشـک‌انـداز** / mûšak'andāz ، ـهـا/: *صفت.* مووشەکهاوێژ؛ شـیاو و لێهـاتوو بـۆ هاویشـتنی مووشەک.

**موش کله** / mûškole ، ـها/: *اسـم.* مشـکەخەزاڵ؛ گیانـدارێکی گوانـداری وەک کەروێشـکە بـە دەست و پێ و گوێ و کلکی گچکەوە کە بە گژ و گیا دەژی: **هیراکس**

**موشگیر** / mûšgîr/ ☜ **زَغَن**

**مـوش‌مردگـی** / mûšmordegî/: *اسـم. [کنـایی]* کار و ڕەوتی خۆ کز نیشان دان؛ خـۆ لـە مـردن دان ‹پیش مدیر خودش را بـە مـوش‌مردگـی مـی‌زد و دیگران را گناهکار جلوە می‌داد: لەلای بەڕێوەبەوە خۆی کز نیشان دەدا و خەڵکی دەکردە تاوانبار›.

**موش مرده** / mûšmorde/: *صفت. [گفتاری]* خس؛ خست؛ مارمردە؛ ڕێوی‌تۆپیو؛ ئاگر ژێر کا.

**موشواره** / mûšvāre/ ☜ **ماوُس**

**موشی** / mûšî/: *صفت.* مشکی: ۱. سەر بە مشک ‹دُم موشی: کلکی مشکی› ۲. ڕەش‌باو؛ بە ڕەنگـی خوڵەمێشی مەیلەو ڕەش ۳. چکۆلە؛ بووچکەلە؛ گچکە؛ بیچک.

**موصـوف** / mowsûf, mo:sûf/: [عربـی] *صـفت.* ۱. *[دسـتور]* بەرئاوەڵـناو ‹در عبـارت «مـردِ خـوب»، «خوب» صفت است و «مرد» موصوف: لـە سارسـتەی «پیـاوی چـاک»دا، «چـاک» ئاوەڵـناو و «پیـاو» بەرئاوەڵـناو› ۲. **باسـکراو** ‹شـخص موصـوف لبـاس عجیبی به تن داشت: کەسی باسکراو جـل‌وبـەرگێکی سەیری لەبەردا بوو›.

**موصــول** / mowsûl, mo:sûl/: [عربـی]/*اسـم. [دستور]* لکێنە؛ وشەی پێکەوەلکاندنی دوو بەشی ڕستە (وەک «کە»).

**موصی** / mûsî/: [عربی]/*اسم.* وەسیەتکەر.

**موضع** / mowze', mo:ze' ، ـها؛ مواضع/: [عربـی] *اسم.* ۱. جێ؛ جێگە؛ یاگێ؛ شوێن؛ پـێ و شـوێن ۲. هەڵوێسـت؛ بۆچـوون ‹در ایـن مـورد موضـع محافظەکارانەای داشـت: لـەم بابەتـەدا هەڵویسـتێکی خۆپارێزانەی هەبوو›.

◘ موضع گرفتن: هەڵوێست نواندن؛ هەڵوێسـت گـرتن ‹روزنامـەهـا علیـه او موضـعگیری کردنـد: ڕۆژنامەکان لە دژی ئەودا هەڵویستیان نواند›

**موضـعگیری** / mowze'gîrî, mo:ze'- ، ـهـا/: [عربی/ فارسی]/*اسـم.* ۱. کـار و ڕەوتی هەڵوێسـت نواندن؛ هەڵوێست‌گرتن ۲. جێگـری؛ جـێگیری؛ کـار یـان ڕەوتی جـێ‌گـرتن ‹دشمن بـالای تپـه موضـعگیری کـرده بـود: دژمـن لـە سـەر تەپۆڵـکەوە جێگری کردبوو›.

**موضـعی** / mowze'î, mo:ze'î/: [عربـی] *صـفت.* ۱. سەر بە شوێنێکی دیـاریکراو ۲. تایبـەت بـە شوێن یا خاڵێک.

**موضـوع** / mowzû', mo:zû' ، ـها؛ ـات/: [عربـی] *اسم.* بابەت؛ سەرباس: ۱. ئەوەی دەکەوێتـە بـەر قسـە و لێـدوان ۲. مـژاد؛ درگـە؛ درخـە؛ ئـەو مەبەستە لە سەری نووسـراوە یـان بەرهـەمێکی هۆنەری لێ سازکراوە ‹موضوع مقالە؛ موضـوع فـیلم: بابەتی وتار؛ بابەتی فیلم›.

**موضوعی** / mowzû'î, mo:zû'î/: [عربـی] *صـفت.* بابەتی؛ بە پێی بابەت ‹فهرست موضوعی: پێڕسـتی بابەتی›.

**موضــوعیت** / mowzû'îyyat, mo:zû'îyyat/: [عربی]/*اسم.* بار و دۆخـی لـە ئـارادا بـوون ‹چنین

بحثی موضوعیت ندارد: ئاوا باسێک لە ئارادا نیە›.

**موطن** / mowten, mo:ten, mûten ، ـها/: [عربی]/اسم. نیشتمان: ۱. زێدگە؛ زێد ۲. ماڵبەند؛ جێ ماڵ و ژیان.

**موظف** /movazzaf/: [عربی] صفت. ئەرکدار؛ بەرئەرک؛ ئەرک لە سەر.

▣ **موظف بودن**: لە سەر بوون؛ ئەرکدار بوون؛ بەر ئەرک بوون ‹او موظف بود به شما خبر بدهد: ئەو لە سەری بوو هەواڵتان پێبدا›.

**موظف شدن**: کرانە سەر؛ بەرئەرک بوون؛ ئەرکێ وە ئەستۆکەوتن ‹موظف شدم کار را به اتمام برسانم: کرایە سەرم کارەکە تەواو بکەم›.

**موظف کردن**: کردنە سەر؛ بەر ئەرک کردن؛ ئەرکێ وە ئەستۆ خستن ‹آنان را موظف کرد سر وقت حاضر شوند: کردیە سەریان بە وەخت ئامادە بن›.

**موعد** / mow'ed, mo:'ed, mû'ed ، ـها/: [عربی] /اسم. ۱. کات؛ سات ‹موعد پرداخت حقوق: کاتی دانی مووچە› ۲. *[قدیمی]* ژوان.

**موعظه** / mow'eze, mo:'eze ، ـها؛ مواعظ/: [عربی] /اسم. کارووس؛ وتاری ئایینی؛ ئامۆژگاری دینی.

**موعود** /mow'ûd, mo:'ûd/: [عربی] صفت. دیاریکراو؛ وادەدراو؛ بەڵێن لە سەردراو ‹روز موعود: ڕۆژی دیاریکراو›.

**موفق** /movaffaq/: [عربی] صفت. ۱. کامەران؛ بە ئارەزووگەیشتوو ‹در زندگی موفق بود: لە ژیاندا کامەران بوو› ۲. سەرکەوتوو ‹در همەی مسابقەها موفق بود: لە هەموو کێبەرکێکاندا سەرکەوتوو بوو›.

**موفقیت** / movaffaqîyyat ، ـها/: [عربی] /اسم. ۱. کامەرانی؛ ڕەوت یان دۆخی بە ئارەزوو گەیشتن ۲. سەرکەوتوویی؛ کار یان ڕەوتی فەرکۆشین؛ سەرکەوتن.

**موفقیت‌آمیز** /movaffaqîyyatāmîz, -'āmiz/: [عربی/ فارسی] صفت. سەرکەوتووانە؛ وێرای سەرکەوتن ‹تلاش موفقیت‌آمیز: هەوڵی سەرکەوتووانە›.

**موقت** /movaqqat/: [عربی] صفت. کاتی؛ ساتی؛ نەتم؛ تاوەکی؛ سەر بە کات و ساتێکی کورت ‹کار موقت؛ خانەی موقت: کاری کاتی؛ ماڵی تاوەکی›.

**موقتاً** /movaqqatan/: [عربی] قید. جارێک؛ جارێ ‹موقتاً این اتاق در اختیار شماست: جارێ ئەم دیوە بە دەستانەوەیە›.

**موقتی**[1] /movaqqatî/: [عربی] صفت. تاوەکی؛ کاتی؛ ساتی؛ گاڤی؛ سەب؛ نە هەمیشە؛ نەتم ‹این کار موقتی است: ئەم کارە تاوەکیە›.

**موقتی**[2]: قید. *[گفتاری]* تاوەکی؛ سەب؛ گاڤی؛ کاتی؛ ساتی؛ سەردەمی؛ وەختی؛ نەتم ‹اینجا موقتی کار می‌کند: لێرەدا تاوەکی کار دەکا›.

**موقر** /movaqqar/: [عربی] صفت. مەند؛ سەنگین و پشوو لە سەرخۆ.

**موقع** / mowqe', mo:qe' ، ـها؛ مواقع/: [عربی]/اسم. کات؛ حان؛ ئان؛ دەم؛ گاف؛ وا؛ چاخ؛ قا؛ نیر؛ هەل؛ وەخت و عان ‹هر موقع پول لازم داشتی بگو!: هەر کاتێک پارەت پێویست بوو دەنگ کە!›.

**موقعِ** /mowqe'e, mo:qe'e/: [عربی] حرف. کاتی؛ عانی؛ ئانی؛ حانی؛ وەختی؛ وەختوو؛ دەمی ‹موقعِ رفتن در را ببند!: کاتی ڕۆشتن دەرکەکە داخە!›.

**موقع‌شناس** / mowqe'šenās, mo:qe'šenās ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. هەلناس؛ وەختناس؛ وەخت‌شناس؛ خاوەن زانیاری لەمەڕ هەل‌وکاتی شیاو بۆ کار یان کردەوەیەک. هەروەها: **موقع‌شناسی**

**موقعیت** / mowqe'îyyat, mo:qe'îyyat ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. هەل؛ دەرفەت؛ وەختی شیاو بۆ کردنی کارێکی دیاریکراو ‹از این موقعیت استفاده کرد: لەم هەلە کەلکی وەرگرت› ۲. بار و دۆخ؛ بار؛ لۆر؛ حالی کەس یان شتێک لە وەختێکی دیاریکراودا ‹در موقعیت خطرناکی قرار گرفته بود: لە

بار و دۆخێکی پڕمەترسیدا بوو›.

**موقوف**[1] / mowqûf, mo:qûf /: [عربی] *شبه‌جمله*. *[تعریض]* بەسیەتی؛ بـا بـەس بـێ؛ کۆتـاکرێ ‹دروغگویی موقوف: بەسیەتی درۆ›.

**موقـوف**[2]: *صفت*. بەسـراو؛ بەسـتراو؛ وابەسـتە؛ بەمەرج ‹ادامەی کار موقوف به همکـاری شـما اسـت: درێژەدان بە کارەکە بە هاوکاری ئێوەوە بەسراوە›.

**موقوفات** / mowqûfât, mo:qûfât /: [عربی] *اسم*. ١. جمـعِ ☜ **موقوفـه** ٢. سـەرجەمی ئـەوەی (ملک یان مال) وەقف کرابێت.

**موقوفـه** / mowqûfe, mo:qûfe ، ـها؛ موقوفـات /: [عربی] *صفت*. مەوقووفە؛ وەقف‌کراو.

**موکـب** / mûkeb, mowkeb, mo:keb ، ـها /: [عربـی] *اسـم*. پشـتمێر؛ پشـتمێرد؛ کەرسـتەی ڕۆشتنی شا یان سەرزلێک بە سـوارە و پیـادەی هاوڕێیانەوە.

**موکت** / moket, muket ، ـهـا /: [فرانسـوی] *اسـم*. مووکیت؛ مووکتە؛ لەی؛ ڕایەخی بە دەزگا چنراو لە بەنی سروشتی و دەسکرد.

**مؤکد** / mo'akkad /: [عربی] *صفت*. ١. پـێداگـر؛ شێلگیر؛ سوورلەسـەر ٢. گـەڕیـانـۆخ؛ شـوێنگر؛ پەیجۆر؛ پەیگێڵ؛ دواگەڕ ٣. مجد؛ سەختگیر.

**مؤکـــــداً** / mo'akkadan /: [عربـــی] *قیـــد*. ١. پەیجۆرانە؛ شـوێنگرانە؛ بـە پـەیجۆر بـوون و شوێنگریەوە ٢. پێداگرانە؛ شێلگیرانە؛ بە سـوور بوون و پێداگریەوە.

**موکل** / movakkel ، ـها؛ ـان؛ ـین /: [عربـی] *اسـم*. *[حقوق]* نوێنەرگر؛ ئەو کەسە بریکاری هەبێ.

**موکـول** / mowkûl, mo:kûl /: [عربـی] *صـفت*. ١. بەسراو؛ بەستراو؛ بەمـەرج ٢. کـەوتوو؛ خـراو ‹افزایش حقوق به مـاه آینـده موکـول شـد: زۆربـوونی مووچە کەوتە مانگی داهاتوو›.

**مـول** / mol /: [فرانسـوی] *اسـم*. *[شـیمی]* مـول؛ یەکەی پێوانی ڕادەی ماک، بریتی لە $6{,}02 \times 10^{23}$ دانە وردیلە (ئەتوم، مولیکوول، ...) کە لەگەڵ ١٢ گرەم توخمی کەربونی ١٢دا بەرامبەرە.

**مول**[1] / mûl /: *اسم*. *[گفتاری]* زینـا؛ زەنی؛ جـووت بوونی ژن و پیاوێ کە هاوسەری یەک نین.

**مول**[2]: *صفت*. زۆڵ؛ بیچ؛ سنۆتە؛ حەرامزادە.

**مولا** / mowlā, mo:lā /: [عربی] *اسم*. ١. *[نامتداول]* سەروەر ٢. ئەرباو؛ ئاغا؛ ئەرباب.

**مولد**[1] / movalled ، ـهـا /: [عربـی] *اسـم*. ١. ـان؛ ـــیـن/ بەرهــەمهێن؛ وەبــەرهێن ‹مولـد بـرق: بەرهەمهێنـــی کارەبـا› ٢. تـوخمی پێکهێنــەر ٣. *[ریاضـی]* خـاڵ، هـێڵ یـان پـەڕەیێ کـە لـە جووڵانەوەی خاڵ، هێڵ یـان پەڕەیـەکی دیکـە بەدی بێت.

▣ **مولـد بـرق**: بەرهـەمهێنی کارەبا؛ ژینراتـۆر؛ ماشـێنێ کـە لـە هێـزی میکـانیکی، کارەبـا بەرهەم دێنێ.

**مولد**[2]: *صفت*. بەدیهێنەر؛ وەبەرهێنــەر ‹نیروهـای مولد: هێزە بەدیهێنەرەکان›.

**مولد** / mowled, mo:led /: [عربـی] *اسـم*. *[ادبـی]* زاینگە؛ زاگە؛ زێدگە؛ زێـد ‹مولـد او حلبچـە اسـت: زێدی هەڵەبجەیە›.

**مؤلـف** / mo'allef ، ـها؛ ـان؛ ـین /: [عربـی] *اسـم*. دانەر؛ داهێنەری بەرهەمی زانستی، وێژەیی یان هونەری، بەتایبـەت نووسـەری کتێـب، گوتـار و نامیلکـە ‹علاءالـدین سـجادی مؤلـف کتـاب رشـتەی مروارید: عەلائەدین سەجادی دانەری کتێبی ڕشتەی مرواری›.

**مؤلفـات** / mo'allafât /: [عربـی] *اسم*. دانـراوان؛ نووسراوان.

**مؤلفه** / mo'allefe ، ـها /: [عربـی] *اسم*. ١. نوێنـەر؛ نیشـاندەر؛ ئـەوی چۆنـاوچۆنی شـتێک دەرخـا ٢. *[ریاضـی]* سـەرجەم و ئاکـامی چەنـد نوانـە (بوردار)، کە بوونەتەوە یەکێک.

**مولکول** / molekûl /: [فرانسوی] ☜ **مُلِکول**

**مولکولی** / molekûlî /: [فرانسوی] ☜ **مُلِکولی**

**مـــولم** / mowlem, mûlem /: [عربـی] *صـفت*.

خەمهێنەر؛ ئازاردەر؛ بە ژان؛ بە سوێ؛ بە ئازار.

**مولـود** / mowlûd, mo:lûd/: [عربـی]/اسـم. ١. /ـها؛ موالید/ زارۆ؛ ڕۆڵە؛ منداڵ؛ لـە دایـک بـوو ٢. ڕەوتی دایک بوون؛ هاتنـە دنیـا ٣. [مجازی] شـوێنهات؛ بەرهـەم؛ ئاکـام؛ سـۆخی؛ دۆنگـی ‹همەی این بدبختی‌ها مولود بیسوادی است: گشت ئەم بەدبەختیانە شوێنهاتـی نەخوێندەواریە›.

**مولـودی** / mowlûdî, mo:lûdî/: [عربی]/اسم. مـەولوویی؛ مـەولوودی: ١. ڕێوڕەسمێـک بـۆ جێژنی لە دایک بوونی پێغەمبەری ئیسلام (س) بە خوێندنی مەولوودنامە ٢. ئاهەنگ و سروودێکی مەزهەبی بە بۆنـەی جێـژنی لـە دایـک بـوونی پێغەمبەری ئیسلام (س) و لە پەسنی ئەودا.

**مولـودی‌خـوان** / mowlûdîxān, mo:lûdî-، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. مـەولوویی‌خـوێن؛ مەولوودی‌خوێن؛ ئـەو کەسـەی مەولوونامـە بـە ئاهەنگەوە دەخوێنێ.

**مولیبـــــدن** / molîbden/: [فرانســـوی]/اســـم. مولیبـدێن؛ تـوخمی شـیمیایی کـانزایی، بـە ژمارەی ئەتۆمی ٤٢ و کێشـی ئـەتۆمی ٩٥,٩٤ و ڕەنگی خوڵەمێشیەوە کە زۆر قورس و ڕەقە، لـە ئاودا ناتوێتەوە و بۆ ڕێختـەکردنی پـۆلا بـە کـار دێ.

**مولیـــدن** / mûlîdan/: مصـــدر. لازم. [قـــدیمی] قارقلین؛ کشکشین؛ کشان؛ درەنگ کـردن؛ دێـر کردن؛ درەنگ بە سەردا هاتن.

**موم** / mûm/: اسم. مێـو؛ مـۆم؛ مـووم؛ کـراش؛ کراشـە؛ کـرێش؛ کـراژ؛ کـراژ؛ مـاکێکی نـەرمی مەیلەو زەردە لە ئاودا ناتوێتەوە لـە کـان، گیـا و گیانەوەر و بەتایبـەت لـە تواندنـەوە و پـالافتنی شانەی هەنگوێن بەرهەم دێ.

▣ **موم پارافین**: پارافینی گرساو.

**موم گوش**: [فیزیولۆژی] کەڕێ؛ مـاکێکی زەردی مەیلەو قاوەیی کە لە لووەکانی پێستی گـوێی گواندارانەوە دەدەڵێت و بەرگری ئـاو و تـۆز و خوڵ و مێرووە بۆ ناو گوێ.

**موم معدنی** ☜ **مومیا**

**مومتال** / mûmetāl/: [فرانسـوی]/اسم. مووميتـال؛ ئالیـاژی ئاسـن، مـس، مولیبـدێن و نیکـل بـە تایبەتمەندی میگناتیسی زۆرەوە.

**مـــؤمن** / mo'men, mo:men/: [عربـی] صفت. ١. ئیمانـــدار؛ بـــەئیمان؛ خـــاوەن ئیمـــان؛ تایبەتمەندی ئەو کەسەی بە خودا و یەکێک لـە پێغەمبەران بڕوای هەیە ‹مسلمان مـؤمن؛ مسیحی مـؤمن: موسلـمانی ئیمانـدار؛ مەسـیحی بـەئیمان› ٢. موسولـــمان؛ خـــاوەن بـــڕوا بـــە خـــودا و پێغەمبەری ئیسلام ٣. تایبەتمەنـدی کەسـێکی بە شتێک بڕوای هەیە و لە سەری سوورە.

**مؤمنانـه** / mo'menāne, mo:menāne/: [عربی/ فارسی] قید. بەئیمانەوە؛ ئیماندارانە.

**مـــومی** / mûmî/: صفت. ١. مـؤمی؛ مۆمینـــە؛ مێـوین؛ لـە مێـو چـێ‌کـری ‹مجسـمەی مـومی: پەیکەری مـۆمی› ٢. مۆماوی؛ بـە مۆمـەوە تـلاوە ‹نخ مومی: بەنی مۆماوی›.

**مومیـــا** / mûm(i)yā/: [معـرب از یونـانی/ ؟]/اسـم. مۆمنا؛ مۆمیا؛ ماکێکی قاوەیی تۆخ و دەڵەمە کە لە زەوینی نەوتداردا بـەدی دێ و لـە کۆنـدا بـە ڕۆن دەیانگرتەوە و هەویرەکـەیان بـۆ دەرمـانی برین و شکستە و ڕاگرتنی لەشی مردوو بـە کـار دێنا: **مومیایی ـ٢**

**مومیائی** / mûm(i)yā'î/: [معرب] ☜ **مومیایی**

**مومیـــــایی** / mûm(i)yāyî/: [معـــرب]/اســـم. ١. مۆمیـــایی؛ مۆمنـــایی؛ میمنـــایی؛ کـــەلاکی مۆمیـاکراو بـە مەبەسـتی بـەرگری لـە داڕزانی ٢. ☜ **مومیا * مومیائی**

**مونتاژ** / montāj/: [فرانسوی]/اسم. مونتاژ: ١. کـار و ڕەوتی سـوارکردن و پێکـەوە نـانی بەشـگەلی ماشین یان دەزگایەک ‹مونتاژ تلویزیـون: مونتـاژی تەلەڤزیۆن› ٢. کار و ڕەوتی لەپاڵ یەک دانـان و پێکـەوە نـانی فـیلم، شـریتە یـان نووسـراوەی

چاپەمەنی بە مەبەستی پێکهێنانی بەش یان کۆمەڵەیەک ‹مونتاژ فیلم: مونتاژی فیلم›.

**مونتاژکار** / montājkār ، ـها؛ ـان/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. مونتاژکار؛ پێکەوەنەر؛ ئەو کەسەی پیشەی مونتاژ کردنە.

**مؤنث** / mo'annas/: [عربی] صفت. ما؛ مان؛ ماک؛ مێ؛ مێو؛ ماینە؛ مێچک: ۱. پێچەوانەی نێر ۲. پێوەندیدار یان سەر بە زایەندی مێ.

**موند** / mond/: [فرانسوی]/اسم. موند؛ کلاس؛ تیپ؛ ڕواڵەتی کەس، شت یان شوێنێک وەها کە نوێنەری پلەی کۆمەڵایەتی بێ ‹دیدیم موند مشتریها به ما نمی‌خورد: دیتمان موندی مشتەریەکان بە ئێمە ناخوا›.

**مونس** / mûnes/: [عربی]/اسم. هاودەم؛ هامدەم؛ هامڕاز.

**مونیتور** / monîtor ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. شاشە؛ مونیتور: ۱. پەڕەی نمایشی دەزگای کەمپیوتەر ۲. پەڕەی نمایشی تەلەڤزیۆن.

**موومان** / movûmān ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. مۆڤوومان؛ یەکەی دیاریکراو لە پێکهاتەی بەستەیەکی مووسیقا بە تایبەتمەندی سەربەخۆوە ‹هر سمفونی از چهار موومان تشکیل می‌شود: هەر سەمفۆنیەک بریەتی لە چوار مۆڤوومانە›.

**موهبت** / mowhebat, mo:hebat, mûhebat ، ـها؛ مواهب/: [عربی]/اسم. بەش؛ بەهرە؛ پیت؛ شتی زۆر بەنرخ کە بە کەسێک خەڵات کرابێ ‹موهبت الهی: بەشی خوایی›.

**موهر** / mûher/: [انگلیسی]/اسم. موهێر؛ پارچە و بەنی بەرهەمهاتوو لە خوری ئانقەرە (ئانکارا).

**موهن** / mûhen/: [عربی] صفت. سووک؛ سۆک؛ بە سووکایەتی؛ هاوڕێ لەگەڵ سووکایەتی ‹سخنان موهن: قسەی سووک›.

**موهومات** / mowhûmāt, mo:hûmāt/: [عربی] /اسم. ۱. وەژارە؛ هەزارە؛ خەیالات؛ بیر و باوەڕێ کە تەنیا لە خەیاڵەوە هەستابێ ۲. پڕ و پووچ؛ خورافات.

**موهوم‌پرست** / mowhûmparast, mo:hûm- ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. خورافاتی؛ بڕوادار بە بوونەوەرانی خەیاڵی و بیر و هزری پڕ و پووچ. هەروەها: **موهوم‌پرستی**

**موی** / mûy/: اسم. [ادبی] موو؛ موویە؛ موی.

**مؤید** / mo'ayyad/: [عربی] صفت. ۱. پەسەندکراو ۲. پشتگیراو؛ یارمەتیدراو؛ پشتیوانیکراو ۳. سەرکەوتوو.

**مؤید** / mo'ayyed/: [عربی] صفت. ۱. پەسەندکەر؛ پەسندەر ۲. پشتگر؛ یارمەتیدەر؛ پشتیوانیکەر.

**مویرگ** / mûyrag ، ـها/: اسم. ڕەهچک؛ وردەڕەگ؛ وردەموو؛ ورتکە ڕەگی نێوان ڕەگە خوێنبەر و خوێنهێنەکانی لەش کە وەک تۆڕ هەموو لەش دەتەنێتەوە.

**مویز** / mavîz ، ـها/: اسم. مێوژ؛ مەویژ؛ ماوژ؛ مۆوژ؛ مەوژ؛ مەووژ؛ مەڤیژ؛ مەهووژ؛ مەڤێژە؛ هەچکوچی؛ هەچکوچ؛ کشمیشی ڕەش و گەورە و دەنکدار.

▣ **یک مویز و چهل قلندر** ☜ **یک**[2]

**مویزک** / mavîzak/: اسم. دەمووکانە؛ دەمکانە؛ دمکانە؛ دەمووکە؛ دوکا؛ دووکاتە؛ دۆکانە؛ دێکانە؛ بێکوانە؛ بەردەموکانە؛ بەردەمووکە؛ مێورۆکە؛ زلیقۆ؛ هۆداخ؛ گیایەکی لە تیرەی هەلالەیە بە گوڵی بنەوش یان سپی هێشوویی جوانەوە، تۆمەکەی بۆ دەرمان ئەشێ.

**مویه** / mûye ، ـها/: اسم. [ادبی] کرووزە؛ کرووز؛ مورر؛ شیوەن؛ شین و شەپۆڕ؛ وشش؛ کاویان؛ گریە و ناڵە.

**موییدن** / mûyîdan/: مصدر. لازم. [نامتداول] // **موییدی**: کرووزایتەوە؛ **می‌مویی**: دەکرووزیتەوە؛ **بموی**: بکرووزەوە // کرووزانەوە؛ شین و شەپۆڕکردن؛ شیوەن کردن؛ کالین؛ ئەوەکرووزیەی؛ کرووزیایەوە؛ گریان بە دەم ئاهـ و

ناڵەوە.

**مـــویین** / mûyîn/: صـفت. مووینـــە؛ مـــووین؛ مووووین: ١. دروسـت‌کـراو لـە مـوو ٢. [مجـازی] وەک موو؛ زۆر باریک * **موئین**

**مــە** [1] / mah/: اسـم. [مخـفـف] مەهـ ؛ مـا؛ مـان؛ سووکەڵەی مانگ.

**مەـ** [2]: پیشواژە. مـاـ ؛ مـەیـــ ؛ مانـگ؛ زۆر جـوان، وەکوو مانگ ‹مەلقا: ماڕوخسار›.

**مه** / meh/: اسم. ١. مژ؛ مژە؛ موژ؛ خومـام؛ تـەم؛ دومان؛ مۆران؛ تەم و مـژ؛ تەمـە؛ تومـان؛ هـۆڵ؛ تامار؛ مـژ و تـەم؛ هـەوری نـەوی ٢. [فرانسوی] مانگی پێنجم لە ساڵی زایینی کە ٣١ ڕۆژە و لـە ١١ی گوڵانەوە دەست پێ‌دەکا: **مِی**

**مه آلـود** / mehālûd/: صـفت. تـەماوی؛ تـەمین؛ مژاوی؛ بە مژ؛ پۆشراو لە مـژ ‹کوهستان مـه‌آلـود: کوێستانی تەماوی›.

**مهابت** / mahābat/: [عربی]/اسـم. ١. ترسـناکی؛ زەرەنـدی؛ خۆفنـاکی؛ سـامناکی؛ گرتۆڵـەیی؛ بەسامی؛ ترسـاوەری؛ دۆخ یـا چۆنیـەتی بەسـام بـوون ٢. گـەورەیی؛ شـکۆ؛ پایەبـەرزی؛ ئـەوی ترسی هاوڕێ لەگەڵ ڕێز بەدی دێنێ.

**مهـاجر** / mohācer ، ـهـا؛ ـان؛ ـیـن/: [عربی]/اسـم. ١. کۆچەر؛ مشەخت؛ مەژیر؛ مەرژیر ‹یک مهاجر افغانی در خانه‌ی ما کار می‌کند: کۆچەرێکی ئەفغانی لە ماڵی ئێمەدا کار دەکا› ٢. [اسلام] موهاجیر؛ هـەر کـام لـەو کـەسانەی کـە دەگـەڵ پێغەمبـەری ئیسلامدا لە مەککەوە کۆچیان کردە مەدینە.

**مهاجرت** / mohācerat ، ـهـا/: [عربی]/اسم. ڕەو؛ کۆچ؛ بـار؛ کـۆچوبـار؛ کـار و ڕەوتی ڕۆشـتن لـە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی‌تر بۆ حەوانەوە و ژیان.

▣ **مهـــاجرت فصـــلی**: کـــۆچی وەرزی؛ وەرزە؛ کـــژەڕەو؛ ڕۆیشـــتن لـــە شـــوێنێکەوە بـــۆ شوێنێکی‌تر بە پێـی گـۆڕانی وەرز و سـەرد و گـەرمی هـەوا، کـە هـەموو ساڵـێک دووپاتـە دەبێتەوە ‹مهاجرت فصلی پرندگان: کۆچی وەرزی پەلەوەران›.

▣ **مهـاجرت کـردن**: کـۆچ‌کـردن؛ بـار کـردن؛ وەنایش؛ ڕەوکردن؛ بە مەبەسـتی نیشـتەجێ بوون لە شار یان وڵاتێکی نـوێ، شـار و وڵاتی خۆ بەجێ‌هێشتن.

**مهاجرنشـــین** / mohācernešîn ، ـهـا/: [عربـی/ فارسی]/اسـم. کۆچـەوار؛ کۆچـەواری؛ مەڵـبەندی هێوران و نیشتەجێ بوونی کۆچەران.

**مهاجم** [1] / mohācem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربـی]/اسـم. شـالاوبەر؛ پـەلاماردەر؛ وروژمکـەر؛ هاژۆتکـار؛ هەڵـمەتدەر؛ ئـەوەی بـۆ ئـازار پـێ‌گەیانـدن هەڵمەت دەبا ‹مهـاجـم مصلح بـود: شـالاوبەرەکە چەکدار بوو›.

**مهاجم** [2]: صفت. پەلاماردەر؛ وروژمکەر؛ هاژۆتکـار؛ هەڵمەتبەر؛ هەڵمەتدەر؛ هورووژمبەر؛ شالاوبەر؛ هێرش‌بەر؛ نژدەڤان ‹مرد مهاجم دستگیر شد: پیـاوە پەلاماردەرەکە گیرا›.

**مهـاد** / mehād/: [عربی] صفت. ١. گرینـگ‌تـر؛ گەورەتر ٢. سەر بە ئەندام یا تاقمێکی گـەورەتر ٣. سەر بە دەرسێکی زانکۆ کە وەک ڕشتەیەکی تایبەتی هەڵبژێراوە.

**مهار** / mahār/: [عربـی]/اسـم. ١. ـ/ـهـا/ هەوسـار؛ ئەوسار؛ هۆسار؛ جەڵەو؛ جلەو؛ جەڵەب؛ مـەهار؛ کلکەلغاو؛ کلکەڕەشە؛ ئاڵقە و پەتێ کە دەخرێتە ملـی مالاتـەوە و بـەوە ڕادەکێشـرێ ٢. مـەهار؛ مهـار؛ کـار و ڕەوتی ڕاگـرتن و بـەڕێوە بـردنی کەرستەی بزۆک.

▣ **مهـار کـردن**: ١. هەوسـارکردن؛ بەسـتنەوە؛ مەهارکردن ٢. تەمراندن؛ ڕاگیرکـردن؛ پـێش گرتن؛ بەرگرتن؛ وەرگێرتەی ‹آتش را مهار کرد: ئاورەکەی تەمراند›.

**مهاربنـد** / mahārband/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. گوریسی قایم و پتەو بۆ بەستن و ڕاگرتنی شتێ لە شوێنێک.

**مهارت** / mahārat ، ـها/: [عربی]/اسـم. وەسـتایی؛

هۆستایی؛ لێزانی؛ ژێل؛ کارامەیی؛ تەڕدەستی؛ تەڕدەسی؛ زەبەردەستی؛ سەرڕشتە؛ قالی؛ ئادا؛ پسپۆڕی؛ دەگەر؛ شارەزایی لە کار؛ لێهاتوویی لە وەدیهێنانی زانیاری خۆ ‹مهارت در نجاری: وەستایی لە نەجاریدا›.

**مهبانگ** / mehbāng/:اسم. بیگ‌بەنگ؛ دۆزێ کە دەلێ هەموو دنیا چەند میلیارد سالی پێش لە تەقینەوەی خالێک بەدیهاتووە: **انفجار بزرگ؛ نظریەی مهبانگ**

**مهبل** / mahbel/: [عربی]/اسم. دۆلان؛ زێ؛ بۆڕیچەی منالدان.

**مه پیکر** / mahpeykar ، ـان/: صفت. [مجازی، ادبی] گولەندام؛ گولندام؛ گولەنام؛ گولنام؛ گولبەژن؛ دەلال؛ خوشیک (بۆ کچ و ژن).

**مهتاب** / mahtāb/:اسم. مانگەشەو؛ تریفە؛ تاف‌هەیف؛ مانگەشەوە؛ ماتاب؛ ماتاو؛ شەومە؛ شومە؛ هیڤەرون؛ هەویەشەو؛ هەویۆک؛ تیشکی مانگ ‹مهتاب همه جا را روشن کرده بود: مانگەشەو هەموو لایەکی ڕوون کردبۆوە›: **ماهتاب**

**مهتابی**[1] / mahtābî ، ـها/:اسم. ١. بەرهێوان؛ خولام‌گەردش ٢. ☜ لامپ فلورسنت، **لامپ**

**مهتابی**[2]: صفت. ١. مانگەشەو؛ مانگاشەو ٢. سپی‌مات؛ بە ڕەنگی سپی لێل.

**مهتر**[1] / mehtar ، ـها؛ ـان/:اسم. مەیتەر؛ سەیز؛ مەهتەر؛ بەخێوکەری ئەسپ؛ خزمەتکار و ئاگاداری ئەسپ.

**مهتر**[2]: صفت. [ادبی] گەورەتر: ١. بە تەمەن تر ٢. مەزنتر؛ مازنتر؛ بە پلە و پایەتر.

**مەجبین** / mahcabîn ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. [ادبی] هەنیەمانگ؛ ماجەبین؛ مەیجەمین؛ بە هەنیە و ناو چاوانی زۆر جوانەوە (سەبارەت بە ژن یا کچ).

**مهجور** / mahcûr/: [عربی] صفت. [ادبی] دابڕاو: ١. /ـان/ دوورکەوتە؛ دوورکەوتوو؛ مارزیای ‹ای عاشق مهجور!: ئەی ئاشقی دابڕاو!› ٢. تەرک‌کراو؛ وێل‌کراو؛ پشت‌تێ‌کراو؛ وەلانراو؛ وەلاخراو؛ دەس‌لێ‌هەلگیراو؛ دەس‌ئازیا.

**مهجوری** / mahcûrî/: [عربی]/اسم. [ادبی] دابڕاوی؛ دوورکەوتوویی؛ دوورکەفتگی؛ بار و دۆخی دوورکەوتوو بوون.

**مهد** / mahd ، ـها/: [عربی]/اسم. [مجازی، ادبی] لانک؛ لانکە؛ بێشکە؛ زێد؛ شوێنی سەرهەلدان و تێدا گەورە بوون ‹مهد آزادی: لانکەی ئازادی›.

**مهدکودک** / mahdekûdak ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. باخچەی مندالان؛ دامەزراوەیەک بۆ ڕاگرتنی مندالی لە کۆرپەوە تا سێ سالان، بۆ ماوەی چەن کاتژمێر لە ڕۆژدا.

**مه دود** / mehdûd/:اسم. ڕەشەمژ؛ چڕەدووکەل؛ مژ و تەمی دووکەلاوی لە سەر شارە گەورەکان.

**مهدورالدم** / mahdûroddam/: [عربی] صفت. [اسلام] خوێن‌حەلال؛ شیاوی کوژران.

**مهدویت** / mahdavîyyat/: [عربی]/اسم. ١. دۆخی مەهدی بوون ٢. بڕوا بە هاتنی نەجاتدەرێک.

**مهدی** / mahdî/: [عربی]/اسم. ڕێنوێنی‌کراو؛ دەس‌گیراو؛ ڕێ‌نیشان‌دراو.

**مهذب** / mohazzab/: [عربی] صفت. [ادبی] پاک؛ خاوێن؛ تەوزاو؛ خەملاو؛ ڕازێنراو.

**مهر** / mahr/: [عربی]/اسم. مارە؛ مارەیی؛ میەرە؛ نکا؛ کاوین؛ ئەو بەشە لە دارایی کە پیاو لە کاتی ژن هێناندا پێشکەشی ژنەکەی دەکا یان بڕیار دەدا کە بیدا: **مهریە**

**مهر** / mehr/:اسم. ١. ڤیان؛ مێر؛ میهر؛ دووسی؛ خۆشەویستی ‹مهر مادر: ڤیانی دایک› ٢. ڕەزبەر؛ کەوچەرین؛ میوەگەنان؛ یەکەم مانگی پاییز؛ مانگی حەوتەم لە سالی کۆچی هەتاوی ٣. خۆر؛ خوەر؛ ڕۆجیار؛ ڕۆژیار؛ ڕۆچیار ٤. [گفتاری] مارەیی.

◘ **مهر کسی را در دل پروراندن**: دل بە کەسێکەوە بوون؛ خۆش ویستنی کەسێ؛

خۆش گەرەک/ هەرەک بوونی کەسێک؛ کەسێک خۆش ویستن؛ یۆ وەش سیا/ گەرەک بیەی؛ حەز لە کەسێ کردن ‹سالها مهر او را در دل می‌پروراند: زۆرسالان دلی پیوە بوو›.

مهر ورزیدن: خۆش ویستن؛ خۆش گەرەک بوون؛ وەش ئەسیای/ سیەی/ گەرەک بیەی؛ هەباندن ‹به میهنش مهر می‌ورزید: نیشتمانەکەی خوش دەویست›.

**مهر** / mohr ، ـها/:اسم. ١. مۆر؛ مۆرە؛ موهر؛ واژۆ؛ ناو، نەخش، یان نووسراوەی لە سەر کانزا یان پلاستیک کەندراو بۆ شوێن لە سەر کاغەز دانان ٢. *[شیعه]* بەردەمۆر؛ مۆری جێ ئەنی لە سوژدەدا ٣. *[قدیمی]* ژتون؛ ژیتون.

◘ مهر کردن: مۆرکردن؛ موهرکردن؛ مۆر کەردەی.

**مهراز** / mehrāz ، ـها؛ ـان/:اسم. نژیارڤان؛ میعمار؛ ئارشیتکت.

**مهرآمیز** / mehrāmîz/: صفت. خۆشەویستانە؛ خۆشویستانە؛ بە دلۆڤانیەوە؛ میرەبانانە.

**مهربان** / mehr(a)bān/: صفت. دلۆڤان؛ دلنەرم؛ دڵتەنک؛ مێریڤان؛ میهرەبان؛ میهرەوان؛ خاوەن بەزەیی و دلنەرمی ‹مادر مهربان: دایکی دلوڤان›.

**مهربانانه** / mehr(a)bānāne/: قید. بە میهرەبانیەوە؛ بە دلۆڤانیەوە؛ مێرەبانانە ‹مهربانانه او را در آغوش گرفت: بە میهرەبانیەوە لە ئامێزی گرت›.

**مهربانی** / mehr(a)bānî ، ـها/:اسم. ١. دلۆڤانی؛ میهرەبانی ٢. بەزەوی؛ دلنەرمی؛ بەزەیی.

**مهرپرستی** / mehrparastî/:اسم. خۆرپەرستی؛ ڕۆجیارپرێسی: **میترائیسم**

**مهرگان** / mehr(e)gān/:اسم. میهرەگان؛ مێرەگان؛ میهرەجان؛ جەژنێکی کۆنی ئێرانیە لە شازدەی مانگی ڕەزبەر (میهر) دا دەگیرا.

**مهرگیاه** / mehrgiyāh ، ـها/:اسم. گیائادەمە؛ هەسەنبەگی؛ سێوەخووگانە؛ گیایەکی ئالیکی بە گوڵی سپی مەیلەو شین و بەری گۆشتن و زەردی وەک سێوە، ڕیشەکەی زۆر تیژ و بۆگەنە و بۆ دەرمان دەشێ: **سگ‌کن**

**مهرورزی** / mehrvarzî ، ـها/:اسم. دلۆڤانی؛ میهرەبانی؛ خۆشەویستی؛ کار و ڕەوتی خۆش ویستن و میهرەبانی‌کردن.

**مهر و موم** / mohr-o-mûm/:اسم.*[قدیمی]* لاک و مۆر؛ مۆر و مۆم.

**مهره** / mohre ، ـها/:اسم. مۆرە: ١. موورگ؛ مووروو؛ میەرە؛ میەرگ؛ کرک؛ لەتە خڕیلانە لە بەرد، چێو، شووشە یان کانزا ٢. لەتەی وا بۆ ناو کایە ‹مهرەی شطرنج: مۆرەی شەترەنج› ٣. *[ـگان/]* ئێسک و کرۆژەی پێکهێنەری بربڕاگەی پشت ٤. لەتەیەکی تەخت و کونی کانزایی ناو شەقار بۆ توندکردنی پێچ.

◘ مهرەی اتلس: یەکەم مۆرەی گەردن؛ مۆرەی سەرووی مۆرەغە.

مهرەی پشت: مۆرە/ مۆرەغەی پشت؛ بربڕەی پشت؛ هەر کام لە دوازدە مۆرەی بربڕەی مرۆڤ لە نێوان مۆرەکانی مل و کەمەردا.

مهرەی خروسکی: مۆرەیەکی کانزایی بە دوو پەل لە هەر دوو لاوە بۆ بە دەستەوە گرتن و پێچاندنی.

مهره شطرنج: مۆرەی شەترەنج؛ هەر کام لە ٣٢ پەیکەرەی بچووکی نێو کایەی شەترەنج.

مهرەی کمر: مۆرە/ مۆرەغەی کەمەر؛ بربڕەی کەمەر؛ هەر کام لە پێنج مۆرەی مرۆڤ لە نێوان مۆرەکانی پشت و سێبەندەدا.

مهرەی گردن: مۆرە/ مۆرەغەی مل؛ بربڕەی گەردن؛ هەر کام لە حەوت مۆرەی مرۆڤ لە سەرترین بەشی بربڕاگەدا.

مهرەی مار: مۆرەی مار: ١. *[قدیمی]* بەردێ کە لە پشتەسەری برێ مارەوە دەروێ و دژەژارە ٢. *[زمین‌شناسی]* برێ قاپلۆخی وەک بەرد لێ‌هاتوو کە لە زەوینی ئاهەکی سەر بە خولی

دووهەمی زەویناسیدا دەدۆزرێتەوە.

**مهرەی نرد:** مۆرەی تەختە؛ زاری تەختەنەرد؛ هەر کام لە ٣٠ لەتە خرتۆڵەکانی کایەی تەختەنەرد.

▣ **مهرەی مار داشتن:** *[مجازی]* دۆعای زەڕەشیرینی پێ بوون/ لا بوون؛ لە ڕاکێشانی خەڵک بەرەو خو، لێهاتوو بوون ‹زود همە را دور خودش جمع کرد، اِنگار مهرەی مار دارد!: زوو هەمووی بە دەوری خۆدا کو کردەوە، وەک بێژی دۆعای زەڕەشیرینی پێیە!›.

**مهرەدار** / mohredār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* *[زیست‌شناسی]* مۆرەدار؛ بڕبڕەدار؛ مۆرەغەدار؛ بە بڕبڕاگە و پێکهاتەی ئێسکی؛ گەورەترین گرۆی گیاندار کە لەشی ئێسک و کرۆژنەی تێدایە و بڕبڕاگەی هەیە (وەک ماسی، خزۆک، پەلەوەر و گواندار).

**مهرەماسوره** / mohremāsûre ، ـها/: *اسم.* مۆرە و ماسوورە؛ مۆرە و ماسوولە؛ لەتە کانزای ناوشەقار بۆ لێکنووساندنی دوو لوولە لە جێگایەکدا کە ڕێ‌دەستی پێچاندنیان نیە.

**مهریه** / mahrîyye/: [از عربی] ☜ **مَهر**

**مهکشند** / mehkešand, -kašand/: *اسم.* هەڵکشەی تەواو؛ بانترین ڕادەی هەڵکشانی ئاو لە نیوەی مانگدا.

**مه گرفته** / mehgerefte/: *صفت.* تەمداگرتوو: ١. مژ؛ مژگرتوو ‹هوای مەگرفتە: هەوای مژ› ٢. لێڵ؛ بێ‌نموود.

**مهلت** / mohlat ، ـها/: [عربی] *اسم.* دەرفەت؛ مەودا؛ مۆڵەت؛ واڵە؛ ماوە؛ ماوڵ؛ قانە؛ قان؛ وەرینگ؛ دەرەق؛ کاتی پاشماوە بۆ جێبەجێ بوونی کارێ یان ڕووداوێک ‹برای پرداخت بدهی‌هایم دو روز مهلت دارم: بۆ دانەوەی قەرزەکانم دووڕۆژم دەرفەت هەیە›.

**مه‌لقا** / mahlaqā ، ـیان/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[مجازی، ادبی]* مانگ؛ ماڕوخسا؛ گوڵڕوو؛ خوشیک؛ دەلال؛ زۆر جوان.

**مهلک** / mohlek/: [عربی] *صفت.* کوژەر؛ گوژەر؛ بکوژ؛ کوشندە؛ کوشننە؛ کوژەک؛ کوژننە ‹سم مهلک: ژاری کوژەر›.

**مهلکه** / mahlake ، ـها/: [عربی] *اسم.* قڕانگە؛ تالوکە؛ مۆلەکە؛ جێگەی بڤە؛ شوێنی خەتەر؛ جێگەی ترس و مردن؛ جێگەی مەترسی ‹سعی کرد خودش را از آن مهلکه نجات دهد: هەوڵی دا خۆی لەو قڕانگە ڕزگار بکا›.

**مهم** / mohem(m)/: [عربی] *صفت.* گرینگ؛ گرنگ: ١. جێگەی سەرنج و بایەخ ‹شهر مهم: شاری گرینگ› ٢. بایەخدار ‹کار مهم؛ رویداد مهم: کاری گرنگ؛ ڕووداوی گرینگ›.

**مهمات** / mohemmāt/: [عربی] *اسم.* تەقەمەنی؛ ماکی تەقینەوە بۆ نێو چەکی گەرم (وەک نارنجۆک، فیشەک و بومب).

**مهمان** / mehmān ، ـها؛ ـان/: *اسم.* میوان؛ مێوان؛ مێمان؛ مەیمان؛ میموو؛ مێڤان؛ میڤان؛ مەهڤان؛ مێهڤان؛ میرفان: ١. ئەوەی لە لایەن کەسێکی ترەوە ڕادەگیرێ و پەزیرایی لێ دەکرێ ٢. کەسێ کە لە ماڵی یەکێ‌تر نان دەخوا، دەخەوێ یا ڕێبوارە ‹امشب مهمان داریم: ئەمشەو میوانمان هەیە› ٣. ئەوەی کە خەرجێکی کەسێکی‌تر دەیدا ‹فروشندە گفت این دفعە را مهمان باشید: فرۆشیارەکە گوتی ئەمجارە میوان بن› ٤. مشتەری مێوانخانە یا مسافرخانە ✱ **میهمان**

▣ **مهمان ناخواندە:** مێوانی ناوەخت؛ میوانی بانگ‌نەکراو کە چاوەڕوانی نەبووبێتن.

▣ **مهمان شدن:** بوونە میوان/ مێمان؛ میڤان بوون؛ مێمانەی. هەروەها: **مهمان کردن**

**مهمانپذیر** / mehmānpazîr ، ـها/: *اسم.* مسافرخانە؛ میوانخانە.

**مهمانخانە** / mehmānxāne ، ـها/: *اسم.* مێوانخانە؛ میوانخانە؛ مێمانخانە: ١. هوتێل؛ شوێنێک بۆ حەواندنەوە و پەزیرایی لە میوان بە

پاره ٢. لامەردو؛ لامەردە؛ لامیردە؛ لامیردان؛ دیوەخان؛ دیواخان؛ شوێنی میوانان لە ماڵدا.

**مهماندار** / mehmāndār، ـها؛ ـان/: اسم. میواندار: ١. راسپاردەی دامەزراوەیەک بۆ پێراگەیشتن و حەواندنەوەی میوانان ٢. کەسێ کە لە کەرەسەیەکی هاتوچووی گشتیدا لە موسافرەکان پەزیرایی دەکا ‹مهماندار هواپیما: میوانداری فرۆکە›.

**مهماندوست** / mehmāndûst/: صفت. میوانخۆشەویست؛ مێمان دۆست؛ مێڤانهەوین؛ میوانەوین؛ میواندۆست؛ وجاخ؛ میوانگر؛ بەخزمەت؛ هۆگر و حەز لە میوان. هەروەها: **مهمان‌دوستی**

**مهمانسرا** / mehmānsarā، ـها/: اسم. ١. موتێل؛ میوانخانەی ناو ڕێگە ٢. شوێنێکی سەر بە دامەزراوەیەک لە شارێکدا کە ئەندامانی کاتی سەفەر بۆ ئەو شارە، لەوێ دەبن.

**مهمان‌نواز** / mehmān.navāz/: صفت. میواندۆست؛ میوانخۆشەویست؛ وجاخ؛ میوانگر؛ میواندار؛ وجاخدار؛ میهماندار؛ هۆگر و هۆکارەی میوان ڕاگرتن ‹مردم ایلام خیلی مهمان‌نواز هستند: خەڵکی ئیلام زۆر میواندۆستن›.

**مهمان‌نوازی** / mehmān.navāzî، ـها/: اسم. میواندۆستی؛ میوانخۆشەویستی؛ میوانداری؛ پێراگەیشتن و میهرەبانی لەگەڵ میواندا.

**مهمانی** / mehmānî، ـها/: اسم. میوانی؛ مێوانی؛ مێمانی؛ میڤانی؛ مەیمانی؛ میهمانی؛ میهڤانی؛ قبوولێ؛ قوبلێ؛ میرفانی؛ دەعوەت؛ خرێفەک: ١. ڕێوڕەسمی بانگهێشتن و پەزیرایی لە میوانان ‹آرام مهمانی داده است: ئارام میوانی داوە› ٢. شوێنی بەڕێوە چوونی میوانی ‹دیشب مهمانی بودیم: دوێشەو لە میوانیدا بووین› * **میهمانی**

▣ **به مهمانی رفتن**: بۆ میوانی چوون؛ چوونە میوانی؛ بەشداریکردن لە ڕێوڕەسمی میوانیدا.

**مهمل**[1] / mohmal، ـات/: [عربی]/اسم. [دستور] ١. بێمانا؛ وشەیێ کە بە تەنیا مانایەکی نیە و دەگەڵ وشەی تردا دێ (وەک کاغەز «ماغەز»، کتێو «متێو») ٢. تایبەتمەندی پیتێک کە خاڵی نیە (وەک «س» و «ح»).

**مهمل**[2]: صفت. بێخۆ؛ بێهۆ: ١. خوێڕیلە؛ بەکارنەهاتوو؛ بەکەڵکنەهاتوو؛ بێکارە؛ دەردنەخۆر؛ دەردنەخواردگ؛ دەردنەوەر؛ بێکەڵک ‹آدم مهمل؛ کار مهمل: مرۆی خوێڕیلە؛ کاری بێخۆ› ٢. بێمانا؛ بێبەهرە؛ بێقازانج ‹حرف مهمل؛ فکر مهمل: قسەی بێمانا؛ بیر و خەیالی بێخۆ›.

**مهملات** / mohmalāt/: [عربی]/اسم. هیچکەوپووچکە؛ هیچەکە و پووچەکە؛ شتی بێمانا و بێکەڵک.

**مهمل‌بافی** / mohmalbāfî، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. گەوجانەڕێسی؛ کار و ڕەوتی بڕێشکردن؛ ڕێسانی قسەی بێخۆ و بێمانا.

**مهمل‌گویی** / mohmalgûyî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. گەوجانەویژی؛ گەوجانەڕێسی؛ گەوجەگەوج؛ کار و ڕەوتی گوتنی قسەی بێمانا و پووچەڵ.

**مهمیز** / mehmîz، ـها/: [از عربی]/اسم. ١. مامزە؛ مامز؛ مامێز؛ میهمۆز؛ مەهمێز؛ مەمووز؛ زەخت؛ چەنگ؛ زیخت؛ دەرزیک؛ ئاسنێکی نووکتیژە، سوار لە پاشپانیەی چەکمەی قایمی دەکا و پێی لە تەڕادی ئەسپی دەدا و تاوی لێ دێنێ.

▣ **زیر مهمیز کشیدن** ☜ **زیر**[3]

**مهنامه** / mahnāme، ـها/: اسم. [مخفف] مانگنامە؛ گۆڤاری مانگانە.

**مهناوی** / mahnāvî، ـها؛ ـان/: اسم. گرووبانی هێزی چەکداری دەریایی.

**مهندس** / mohandes، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی از هندسه/ معرب از پهلوی]/اسم. ئەندازیار؛ موهەندیس: ١. دەرچووی زانکۆی ئەندازیاری ٢. نژیارڤان؛ ئارشیتکت؛ ئەندازیاری گەلالە داڕژتنی خانوو.

**مهندسی** / mohandesî/: [عربی] *اسم*. ئەندازیاری؛ موهەندیسی: ۱. کار یان پیشەی ئەندازیار: *الف)* فەننی نەخشەڕێژی ماشین ب) گۆڕان و ڕێکخستنی دیاردەکان ‹مهندسی ژنتیک: ئەندازیاری ژنیتیک› ۲. کاربەری زانست بەتایبەت بیرکاری و فیزیک، بۆ کەڵک بردن لە تایبەتمەندی ماک و وزە لە سروشتدا، بە شێوەی پێکهاتە، بەرهەم، دەزگا و شتیتر.

◙ **مهندسی سازه**: لقێک لە ئەندازیاری سەبارەت بە گەڵاڵەداڕێژی بۆ خانووبەرە بە شێوەیەک کە لە بەرانبەر بوومەلەرزە و مەترسیتر ەوە نەڕووخێ. هەروەها: **مهندسی برق؛ مهندسی سیستم؛ مهندسی سویل و...**

**مهوع** / mohavve'/: [عربی] *صفت*. قیزەون: ۱. دڵشێوێن؛ دڵهەڵشێوێن؛ هێڵنجهێنەر؛ هێڵنجاوەر؛ هۆی ڕشانەوە؛ هۆی حاڵ خراپ بوون ۲. *[مجازی]* زۆر ناخۆش و نالەبار ‹غذای مهوع: چێشتی قیزەون›.

**مهیا** / mohayyā/: [عربی] *صفت*. ساز؛ تەیار؛ بەرهەڤ؛ چێ؛ گیف؛ پەرداغ؛ پەرداخ؛ چاخ؛ سازکری؛ کارکری؛ ئامادە بۆ کار یان بۆ سەفەر ‹برای رفتن مهیا شدیم: بۆ ڕۆشتن ساز بووین›.

◙ **مهیا شدن**: چلیان؛ ساز بوون؛ کارکرن؛ درووس بوون؛ دروست بوون؛ خۆ ئامادە و تەیارکردن. هەروەها: **مهیا بودن؛ مهیا ساختن؛ مهیا کردن**

**مهیب** / mahîb/: [عربی] *صفت*. بەسام؛ ترسناک؛ بەخۆف؛ بەمەترسی؛ سامدار؛ جێگەی ترس؛ بە هەیبەت؛ زەرندە ‹صدای مهیب: دەنگی بەسام›.

**مهیج** / mohayyec/: [عربی] *صفت*. زیچێن؛ هەستبزوێن؛ هەستهرووژێن.

**می** / mey/: *اسم*. ۱. *[ادبی]* مەی؛ بادە؛ مەهە؛ خواردنەوەی ئەلکولی کە مرۆ مەست دەکا بەتایبەت شەراو ۲. ☜ **مە ـ۲**

**می** [۱] / mî/: [فرانسوی] *اسم*. *[موسیقی]* می؛ سێهەمین نۆتی گاڤی دیاتونیک.

**میـ** [۲]: *پیشوند*. دەـ؛ ئەـ؛ مەـ؛ مـ؛ نیشانەی درێژەدار بوونی کار ‹می‌آمد؛ می‌گویم: دەهاتم؛ ئەڵێم›.

**ـ می** / omî/: *پسوند*. ـەمی؛ نیشانەی بوون لە ڕیز، پلە یان جێگەیەکی دیاریکراودا ‹یکُمی: یەکەمی›.

**میادین** / mayādîn/: [عربی] جمعِ ☜ **میدان**

**میان** / miyān/: *اسم*. ۱. ناو؛ نێوان؛ ناوەڕاست؛ نێوەڕاست؛ ناوەڕاس؛ ناوڕاس؛ مابەین؛ نابەین؛ بەین؛ مابین؛ مابێن؛ مەیان؛ میان؛ مینە؛ مینجا؛ دلێ ڕاسە؛ نافی ‹میان کوچه: ناوِ کۆڵان› ۲. ناوەند؛ چۆنگ ‹از میان به دو نیم کرد: لە ناوەندەوە کردیە دوو بەش› ۳. *[ادبی]* کەمبەر؛ ناوقەد؛ نەوق؛ قەد؛ کەمەر؛ کەمەرە ‹میان کوه: کەمبەری کێو›.

◙ **در این میان**: لەم ناوەناوە؛ لەم ناوەدا؛ لەم وەختە؛ لەم وەختا؛ لەم ناوا؛ لەم بەینەدا؛ لەم بەینا؛ لەم بەینە؛ لەم کاتەدا؛ لەم کاتە؛ لەم کاتا؛ چی وەختەنە؛ چی بەینەنە ‹در این میان شوهرش هم رسید: لەم ناوەناوە **شووەکەیشی گەیی**›.

**یک در میان**: یەکانیەک؛ یەکنەیەک؛ یەک نا یەک؛ یۆ ناو یۆ؛ بە مەودایەکەوە ‹درختها را یک‌درمیان قطع کردند: دارەکانیان بەکانیەک بڕیەوە›. هەروەها: **دو در میان**

◙ **به میان آمدن**: ۱. هاتنە ئاراوە؛ هاتنە پێشەوە؛ هاتنە نێوەوە؛ ئامای دلێ ‹حرف ورزش به میان آمد: قسەی یاری هاتە ئاراوە› ۲. هاتنە بەین؛ دەست تێوەردان ‹پای بیگانه به میان آمد: پای غەوارە هاتە بەین›. هەروەها: **به میان آوردن؛ به میان کشیدن؛ در میان بودن**

**در میان گذاشتن**: کێشانە پێشەوە؛ هێنانە بەین؛ قسە لێ کردن؛ باس لێ کردن؛ هێنانە بەرەوە؛ هێنانە ئاراوە ‹موضوع عروسی را با او در

میان گذاشتم: باسی زەماوەندم لەگەڵیدا کیشایە پیشەوە›.

**میان** / miyāne/: حرف. نێوان؛ لە نێوان؛ نێو؛ نێوانی: ١. لە نێو؛ لە ناو؛ نێوی؛ دڵێو؛ بەینوو؛ بەینی؛ لە بەینی ‹میان چهار نفر تقسیم شد: لە نێو چوار کەسدا بەش کرا› ٢. بەینی؛ بەینوو؛ لە یەکێکەوە تا یەکێکی تر ‹میان آن دو شهر پنجاه کیلومتر فاصله بود: لە نێوان ئەو دوو شارەدا پەنجا کیلۆمتر مەودا بوو› ٣. لە نێو؛ لە ناو؛ دە نێو؛ ناوی؛ دڵێو؛ دڵێ؛ بەینوو؛ لە بەینی ‹میان لباس‌ها بود: لە نێو جلەکاندا بوو› ٤. لە بەین؛ بەین؛ لەمەڕ لایەن و ئەندامانی ‹میان آنها شباهت زیادی وجود دارد: لە نێوانیاندا وێکچوویەکی زۆر هەیە› ٥. لە ناو؛ لە نێو؛ دە نێو؛ لەگەڵ؛ چنی؛ چەنی؛ لەیل؛ لێل؛ لێل؛ وێڕا ‹میان مردم زندگی می‌کند: لەنێو خەڵکدا دەژی› ٦. لە ناو؛ لە نێو؛ بەینوو؛ بەینی؛ لە بەین؛ لە یەکێ لە دوو لایەنی کار یان کردەوەیەک ‹میان دو دولت جنگ درگرفت: لە نێوان دوو دەوڵەتدا شەڕ هەڵگیرسا› ٧. لە نێو؛ دڵێ؛ ناو؛ لە ناو؛ بەینی؛ بە شێوەی هاوبەش ‹میان مردم شایعاتی وجود دارد: لە نێو خەڵکدا وتەوتێک هەیە›.

**میانبر** / miyānbar/: اسم. [گیاەشناسی] گۆشتی میوە؛ بەشی نێوان توێکڵ و تۆمی میوە.

**میانبر** / miyānbor/: صفت. قەدبڕ؛ قەیبڕ؛ لابڕ؛ سەربڕ؛ نێوانبڕ؛ نێوبڕ؛ ناوبڕ؛ ناڤبڕ؛ نوابڕ؛ لابڕ؛ نزیکترین ڕێ بۆ گەیشتن ‹راە میانبر: ڕێگەی قەدبڕ›.

▣ **میانبر زدن**: قەدبڕکردن؛ نێوان بڕین؛ ناڤبڕ لێدان؛ لابڕ لێدان؛ قەدبڕ لێدان؛ سەربڕ ڕۆشتن ‹میانبر زدم و جلوتر از آنها به خانه رسیدم: قەدبڕم کرد و پێش لەوان گەیشتمەوە ماڵ›.

**میانپردە** / miyānparde/: اسم. ١. [ـە ـا/ بەینپەردە؛ پارچە شانۆیەکی کورت لە نێوان دوو بەشی بەرنامەیەکدا ٢. [زیستشناسی] دیافراگم: میانشامەی رویانی

**میان‌تهی** / miyāntohî/: صفت. ١. بۆش؛ هڵۆڵ؛ هەرۆڵ؛ هولۆل؛ ناوبەتاڵ؛ نێوبەتاڵ؛ ناوخاڵی؛ کولۆر؛ کلۆر؛ کوللۆر؛ قورۆڵ؛ قلۆر؛ بە بۆشایی و هەراوی لەناوەوە ٢. والا؛ بەتاڵ؛ پووت؛ بێناوک؛ بێکاکڵ؛ پووچ؛ قەڵپووت؛ پووک؛ خافوور؛ والا؛ پووچەڵ؛ بێناوەرۆک.

**میانجی** / miyāncî، ـها/: اسم. ناوبژی؛ نێوبژی؛ ناڤبژی؛ ناوبجی؛ ناڤچی؛ ناڤچیت؛ نێونجی؛ مەنجی؛ برەڤان؛ بەریوان؛ بەریڤان؛ بەرەڤان؛ بەیس؛ بێس؛ هەجاس؛ هاجاس؛ هاجاسکەر؛ ناوبژیکەر؛ ناوبژیکار؛ نێوبژەکەر؛ نێوبژیکەر؛ ناڤبژیکەر؛ ناوجیکەر؛ ناوجێکەر؛ نێوانجیکەر؛ ناوەندیار؛ مەنجی؛ کەسێ کە تێدەکۆشێ دوو دژ ئاشت کاتەوە و شەڕ و کێشەیان داکوژێنێ.

**میانجیگری** / miyāncîgarî، ـها/: اسم. هەجاسی؛ ناوبژیکەری؛ بەریڤانی؛ ناوجیکەری؛ ناوجێکەری؛ بەرەڤانی؛ کار یان ڕەوتی نێوان کردن؛ نێوبژیکردن.

**میاندار** / miyāndār، ـها؛ ـان/: اسم. ١. مەیاندار؛ پێشەوای چالاکی وەرزشی لە زۆرخانەدا کە وەرزشکارانی دیکە لەو چاو دەبڕن ٢. [مجازی] قوێخا؛ قەیخا؛ ڕێبەر یان بەڕێوبەری کاروباران ‹هر جا عروسی یا عزایی داشتند او میاندار مجلس بود: لە هەر کوێ شایی و شینێکیان دەبوو، ئەو قوێخای کۆڕەکەیان بوو›. هەروەها: **میانداری**

**میاندل** / miyāndel/: اسم. ١. ☜ **میانشامە** ١. ناودڵ؛ ناوەڕاست؛ نێوەڕاست؛ نێوان؛ چەق و ناوەڕاسی هەر شتێک.

**میاندورە** / miyāndowre, -do:re، ـها/: [فارسی/عربی] اسم. نیوەنیوەی ڕەوت یان زنجیرە چالاکیەک.

**میانزیوی** / miyānzîvî/: اسم. میزوزۆئیک؛ چوارەمین قۆناخی مێژووی زەوی کە گواندارن و پەلەوەران تێیدا سەریان هەڵدا و بە دەورانی دووهەم دەناسرێت.

**میانسال** / miyānsāl ، ـها؛ ـان/: *صفت.* کاڵ؛ کاڵـە؛ کامڵ؛ نیڤنجی؛ قەرت؛ ناڤساڵ؛ نێوان‌ساڵ؛ نـە پیر و نە لاو بە تەمـەنێک لـە نێوان ٤٠ تـا ٥٥ ساڵدا.

**میانشامه**/ miyānšāme/: *اسم. [کالبدشناسی]* ناودڵ؛ چـینی نێوەنـدی ماسـوولکەکانی دەوری دڵ: **میاندل‌ـ۱**

◻ **میانشامەی رویانی** ☜ **میانپرده‌ـ۲**

**میانطوسی** / miyāntûsî ، ـها/: *اسم.* گیایـەکی ڕازاوەی دوو ساڵانە لە گـوزروان دەچـێ، گوڵـی درشت و بەری ڕەش و بریقەدار دەگرێ.

**میانگیر** / miyāngîr ، ـها/: *اسم.* نێـوان‌گـر؛ لەتـە، کەرستە یان ماکێ کە لە ماشین یان ئامرازێکدا، بەر بە لێدان، لێخشان و وەزەن دەگرێ.

**میانگین** / miyāngîn ، ـها/: *اسم.* ناڤـین؛ ناڤـنج؛ مام‌ناونجی؛ دەستە؛ ناوگین؛ ناونجی؛ بەینی زۆر و کەم؛ ڕادەی ناوەڕاست.

**میانمـــدت** / miyānmoddat/: [فارسـی/ عربـی] *صفت.* نێوان‌خایەن؛ ماوەی نە درێژ نە کورت.

**میانونـــد** / miyānvand ، ـهـا/: *اسـم. [دسـتور]* نێوان‌گر؛ ناوگر؛ پیتـێ کـە دەچێتـە نێـوان دوو وشە و وشەیەکی نوێ دروست دەکا (وەک «ـاو» لە «گەرماوگەرم» و «و» لە «دەستودوو»دا).

**میانه** / miyāne/: *اسم.* نێوان: ۱. چۆنگ؛ پونگاڵ؛ نیڤ؛ دڵێ‌ڕاسە؛ داگ؛ گۆڕ؛ خاڵ یان بۆشـاییەک لـە نزیـک ناوەنـدەوە ‹میانـەی میدان: نێوانـی مەیدانەکـە› ۲. چـەق؛ بـەین؛ مابـەین؛ ناڤـدار؛ ناڤبەین؛ دۆمـەی؛ ناڤـبەر؛ ناڤـبرک ‹میانـەی راه: چەقی ڕێگا› ۳. میانە؛ نیڤی؛ نـاونجی؛ نێـونجی؛ ناڤنج؛ مامناوەند؛ چەنیـەتی یـان چۆنیەتیـەکی ناوەڕاسـت و بـە دوور لـە هێواشـی و تونـدی ‹میانـەرو: میانـەڕۆ› ٤. *[هندسـه]* لەتـە هێڵـێ کـە سەری سێ‌گوشەیەک بـە لاسـکی ڕووبـەڕووەوە دەلکێنـێ و دەیکاتـە دوو بەشـی یەکسـانەوە ٥. *[مجازی]* مەیانە؛ بەین؛ میانە؛ مەینە ‹میانەشان خوب نیست: بەینیان خۆش نیە›.

◻ **میانـەای نداشـتن:** *[مجـازی]* بـەین نـەبوون؛ بەین‌خۆش نەبوون؛ نێوان‌خۆش نەبوون؛ بەین وەش نەبیەی ‹او با ورزش میانەای نـدارد: لەگـەڵ وەرزشدا بەینی نیە›.

**میانه را گرفتن:** *[مجازی]* بـەین خـۆش‌کـردن؛ کەفتنـە بـەین؛ نـاکۆکی داکوژانـدن و ئاشـت کردنەوەی دوو لایەنی دژبەیەک.

**میانەی کسی با دیگری به هم خوردن:** *[مجازی]* نێوان دوو کەس تێکچوون؛ بەین شێویان.

**میانەی کسی بـا دیگـران شـکراب شـدن** ☜ **شکراب**

**میانەبالا** / miyānebālā/: *صفت.* باڵاناوەنـدی؛ نـە کورت و نە درێژ.

**میانه حال** / miyānehāl/: [فارسـی/ عربـی] *صفت.* *[مجـازی]* حـاڵ‌ناوەنـدی؛ نـە دەسـتەنگ و نـە دەوڵەمەن.

**میانـەرو** / miyānerow ، ـهـا/: *صفت. [مجـازی]* میانەڕۆ؛ نە زۆر توند و نە زۆر شل لە مەبەست و ئاکاردا.

**میانـەروی** / miyāneravî ، ـهـا/: *اسم. [مجـازی]* میانەڕۆیی؛ بار و دۆخی میانەڕۆ بوون.

**میانی** / miyānî ، ـها/: *صفت.* ناوەنـدی؛ نـاوانی؛ نێوانی؛ ناوەندین؛ ناوەنجی؛ میانی؛ لە ناوەڕاست و نێواندا ‹گوش میانی: گوێی ناوەندی›.

**میـانین** / miyānîn/: *صـفت. [ادبـی]* ناوەنـدی؛ نێوانی؛ ناوەنجی؛ میانی؛ ناوەندین.

**می‌پرست** / meyparast ، ـها؛ ـان/: *صفت. [مجازی، ادبی]* مـەی‌پـەرس؛ مـەی‌پەرسـت؛ مەیـدۆس؛ هۆگری خواردنەوەی ئەلکولی.

**میت** / mayyet, meyyet ، ـها؛ اموات/: [عربی] *اسم.* تەرم؛ مەیت؛ مردوو؛ مـەردە؛ مـردگ؛ مـردووی مرۆڤ ‹مثل میّت دراز به دراز افتاده بود: وەک تـەرم درێژاودرێژ کەوتبوو›.

**میترائیسـم** / mîtrā'îsm/: [پهلـوی/ انگلیسـی] ☜

مهرپرستی

**میترایـوز** / mîtrāyûz /: [فرانسوی]اسم. [نظامی] مترالیوز؛ ئاگربار؛ شێستیر؛ ڕەشاش.

**میتـــــولژی** / mîtolojî /: [فرانســـوی]اســـم. ۱. دیـــرۆک‌ناســـی؛ ئوستوورەناســـی ۲. /ـهـا/ دیرۆک؛ دێرۆک؛ ئوستوورە.

**میتینگ** / mitîng ، ـها/: [انگلیسی]اسم. میتینـگ؛ گور؛ ڕەوتی کۆ بوونەوەی تاقمێ لـه خەڵـک بـۆ دەربڕینی خواست و هەستیان.

▣ **میتینـــگ دادن**: کـــۆڕگرتن؛ خـــڕ بوونـــەوە؛ ڕێخستنی کۆ بوونەوەیـەک و بەتایبـەت وتـار دان لەوێ.

**میثاق** / mîsāq ، ـها؛ مواثیق/: [عربی]اسم. پـەیمان؛ بەڵێن؛ عەهد.

**میجر** / meycer ، ـها/: [انگلیسـی]اسـم. [نامتـداول] مەیجیر؛ سەرگورد.

**میخ** / mîx ، ـها/:اسم. بسـمار؛ بزمـار؛ پسـماری؛ مێخ؛ قەمتەر؛ میلەیەکی خەڵەڵـە یـان قـووچی نووک‌تیژ و سەرپان، بۆ تێهەڵـچەقان و کوتـان و قـایم‌کـردن یـان بەسـتنەوەی شـتێک بـە شوێنێکەوە.

▣ **میخ زدن**: مێخ‌کوتان؛ بزمارکوتان؛ مێخ/ بزمار لێدان؛ پسمارەرەکوەی؛ مێخ‌کوای ‹دو تا میخ بزن به این میز: دوو بزمار بکوتە بەم مێزەدا›.

**میخ شدن**: [مجازی، گفتاری] مێخکـوت بـوون؛ وشک بوون؛ لە جێ خۆ وشـک بـوون ‹همین جور جلوی میز میخ شده بود: هەروا لە بەر مێزەکەدا مێخکوت ببوو›.

**میخ کاری را کوبیدن**: [مجازی] بزماری کارێک داکوتان؛ کار گەیاندنە ڕادەیەک کە جێبەجێ بوونی مسەوگەرە ‹میخ ریاستش را کوبید: بزماری سەرۆکی خۆی داکوتا›.

**میخ کردن**: ۱. داکوتان؛ ئەرەکوەی؛ بـە بزمـار کوتان ‹این عکس را میخ کن به دیوار: ئـەو وێنـە داکوتە بـە دیوارەکـەدا› ۲. [مجـازی] مێخکـوت کردن؛ وشک‌کردن؛ کەسێک بە پاوە ڕاگرتن.

**میخانه** / meyxāne ، ـها/: اسم. [ادبـی] مەیخانـە؛ شـــەرابخانە؛ شـــەراوخانە؛ شـــوێنی ڕانـــان و خواردنەوەی مەی: **میکده**

**میختن** / mîxtan /: [از کردی] مصدر. لازم. [قـدیمی] میزتن؛ میسـتن؛ میزیـان؛ مێزیـان؛ میزکـردن؛ گمێزکردن/ کەردەی.

**میخچه** / mîxče ، ـها/: اسم. بزمـارۆک؛ بزماتـە؛ بزمەتـە؛ بزمـارە؛ بسـمارە؛ مسـمار؛ بسـمارک؛ کەنگرۆشـک؛ کـەنگرۆک؛ مێخەکـە؛ مێخچـە؛ نیخچـک؛ پـۆڕگی پرووش و ئەسـتووری سـەر پێست کە بە هۆی زۆر کوتانەوەی شـوێنێک لـە پێست، بەتایبەت لە ژێر پێ و لەپی دەست و لە سەر قامکی دەست و پێ بەدی‌دێ.

**میخ‌طویله** / mîxtavîle ، ـها/: [فارسی/ عربی]اسم. ئاریخ؛ ئاخیە؛ ئارنج؛ ئۆلـک؛ مـێخ‌زنجیر؛ سـکە؛ مەڕبەند؛ مێخ‌سـکە؛ کلـب؛ گوڵـمیخ؛ گوڵـمێخ؛ میخانە؛ بزماری زلی سەر گۆپتکە.

**میخک** / mîxak ، ـها/: اسم. مێخەک؛ مێخـەکی؛ خەوناوکە: ۱. دارچکێکی جوانی گەڵا هەمیشـە شینی باریک و بەرامبەر بە یەکە ۲. گوڵـی ئـەو دارچکە کە زۆر بۆنخـۆش و هەمەڕەنگەیـە و بـۆ دەرمان دەشێ.

**میخکش** / mîxkeš ، ـهـا/: اسم. ۱. بزمـارکێش؛ مێخ‌هەڵـکێش؛ گازکـەرەکی؛ گـازکی مـێخ پـێ هەڵکێشان ۲. گاز؛ گازئەمور؛ ئەموڕدەس.

**میخکـــوب** / mîxkûb /: صـفت. ۱. بزمـــارڕێژ؛ بزمـارکوت؛ بـە بزمـار قـایم‌کـراو ۲. [مجـازی] مێخ‌کوت؛ وشک؛ نەجووڵ؛ نەجم.

▣ **میخکـــوب شـــدن**: [مجـازی] وشـــک بـــوون؛ مێخ‌کوت بوون؛ لە جێی خۆ وشـک بـوون ‹از ترس در جای خود میخکوب شدم: لـە ترسـان لـە جێی خۆم وشک بـووم›. هـەروەها: **میخکـوب کردن**

**میخکوبی** / mîxkûbî /: اسم. مـێخ‌ڕێـژی؛ کـاری

داکوتانی مێخ به شتێکدا بۆ قایم‌کردنی.
**میخکی** / mîxakî/: *اسم.* مێخەکی؛ ڕەنگی مێخەک؛ سووری تۆخ و مات.
**میخوارگی** / meyxāregî/: *اسم. [ادبی]* ۱. مەینۆشی؛ مەی‌خوەری؛ کاری مەی خواردنەوە ۲. چەشتەیی و هۆکارەیی مەی خواردنەوە.
**میخواره** / meyxāre ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* مەینۆش؛ مەیخۆر؛ مەیخۆرەوە؛ شەراوی؛ هۆگر و هۆکارەی مەی خواردنەوە.
**میخواری** / meyxārî/: *اسم.* مەینۆشی؛ مەیخۆری؛ کاری مەی خواردنەوە.
**میخوش** / meyxoš/: *صفت.* مەیخۆش؛ مێخۆش؛ مێخوەش؛ مزر؛ تامزر؛ ترش و شیرین.
**میخی** / mîxî/: *صفت.* ۱. مێخی؛ بزماری؛ وەک بزمار ۲. خط میخی ☜ **خط**
**میدان** / meydān ، ـها؛ میادین/: *اسم.* مەیدان؛ مەیان؛ فێز؛ گۆڕەپان: ۱. ئاقارێکی خڕ لە بڕگەی چەند شەقامدا ‹میدان آزادی: مەیدانی ئازادی› ۲. مەودایەک تا چاو هەتەر دەکا ۳. کاد؛ قات؛ هێل؛ هێڵ؛ شەڕگە؛ مەیدانی ململانێ و شەڕ ٤. قات؛ کاد؛ زەوینی کایە و وەرزش ٥. ئاقارێ کە دەوراندەوی دووکانە و شتێکی دیاریکراوی لێ دەفرۆشن ‹میدان تره‌بار؛ میدان میوه: مەیدانی تەڕەبار؛ مەیدانی میوە› ٦. ئاقار و بۆشاییێ کە لە ژێر کاریگەری شتێکدایە ‹میدان مغناطیسی: مەیدانی میگناتیسی› ۷. ئەو ئەندازە لە شوێن کە لە چاویلکەی کەرستەیەکەوە دەبینرێ ‹میدان دید: مەیدانی دیتن› ۸. *[مجازی]* جێگەی کار و چالاکی ‹میدان عمل: مەیدانی تێکۆشان›.
▣ **میدان اعدام:** گۆڕەپانێک بۆ کوشتنی حوکم‌دەرچووان.
**میدان الکتریکی/ برقی:** مەیدانی کارەبایی؛ بۆشایی لە ژێر کارتێکردنی بارێکی کارەبایی.
**میدان جاذبه/ گرانش:** مەیدانی ڕاکێشی؛ مەیدانێ کە لەوێدا شتێک، شتێکی‌تر بۆ لای خۆی ڕادەکێشێ.
**میدان مغناطیسی:** مەیدانی میگناتیسی؛ بۆشایی لە ژێر کارتێکردنی ئاسنرفێن یان سیمێک بە ڕەوتی کارەباییەوە.
**میدان مین:** مەیدانی مین؛ ئاقارێ کە مین‌ڕێژ کراوە.
▣ **میدان دادن:** *[مجازی]* بە دەمەوە دان؛ هەل و دەرفەت پێدان؛ دەرفەت دان؛ مەیان پێدان ‹اگر به او میدان بدهی می‌دانی چکار می‌کند؟: ئەگەر بدەی بە دەمیەوە، دەزانی چدەکا؟›.
**از میدان بدر کردن:** بەزاندن؛ شکاندن.
**به میدان آمدن:** هاتنە مەیدانەوە؛ بەرهەڤی کار یا چالاکی بوون ‹بعد از آن ناپلئون به میدان آمد و دوران دیکتاتوری تازه‌ای آغاز شد: پاشان ناپیلیۆن هاتە پێش دەورانی ملهوڕیەکی تازە دەستیپێکرد›.
**به میدان آوردن:** *[مجازی]* هێنانە گۆڕ/ گۆڕێ؛ هێنانە پێشەوە؛ هاوردنە بەرەوە؛ هێنانە مەیدانەوە؛ نانە بەر کار و چالاکی ‹انگلیسی‌ها او را به میدان آوردند: ئینگلیسیەکان هێنایانە گۆڕێ›.
**میداندار** / meydāndār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* مەیداندار؛ مەیاندار: ۱. سەرپەرستی مەیدان (وەک مەیدانی سەبزی و میوە) ۲. دووکانداری نێو وەها مەیدانێک ۳. ئەو کەسەی زنجیرەکارێک سەرپەرشتی دەکا و بەڕێوەی دەبا. هەروەها: **میدانداری**
**میدانگاه** / meydāngāh ، ـها/: *اسم.* گۆڕەپان؛ شوێنێکی بەرباز لە ناوەڕاستی ڕێگا یان لە نێوان چەن خانووبەرەدا ‹وسط میدانگاه درخت نارون سرسبزی بود: چەقی گۆڕەپانەکە نارەوەندێکی چڕی لێ بوو›: **میدانگاهی** *[گفتاری]*
**میدانگاهی** / meydāngāhî/ ☜ **میدانگاه**
**میدانی** / meydānî/: *صفت.* مەیدانی؛ مەیانی؛ سەر بە مەیدان ‹ورزش میدانی: وەرزشی

مەیدانی›.

**میر**[1] / mîr/: [از عربی]/اسم. ۱. سەیید؛ سەیی ۲. [مخفف] میر؛ ئەمیر.

**میر-**[2]: پیشوازه. میر- ؛ سەرۆک؛ سەرەک ‹میراب: میراو›.

**میرا** / mîrā/: صفت. [ادبی] نەمێن؛ نەمەن؛ بە تایبەتمەندی لە ناو چوون و فەوتانەوە.

**میرائی** / mîrā'î/ ☜ **میرایی**

**میراب** / mîrāb ، ـها؛ ـان/: [از عربی/ فارسی]/اسم. وەراز؛ میراو؛ ئاریختێ؛ میراڤ؛ مەرداب؛ کەراخ؛ ئەو کەسەی بە سەر بەش‌کردنی ئاودا ڕادەگا.

**میراث** / mîrās ، ـها؛ مواریث/: [عربی]/اسم. هشتە؛ کالکی؛ میراس؛ پاشماگە؛ میرات؛ جامەنە؛ کەلەپوور؛ کەلەپوور؛ ئەوی لە کەسێکەوە بۆ پاشماوەکانی دەمێنێتەوە.

**میراث‌خوار** / mîrāsxār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. میراتبەر؛ میراتگر.

**میراخور** / mîrāxor ، ـها؛ ـان/: [از عربی/ فارسی] /اسم. میراخوڕ؛ کەسێ کە بە سەر تەویلەی خان و شادا ڕادەگا.

**میراندن** / mîrāndan/: مصدر. متعدی. // **میراندی**: مراندت؛ **می‌میرانی**: دەمرێنی؛ **بمیران**: بمرێنە// ۱. مراندن؛ مرانن؛ مرنەی؛ مرنای؛ کوشتن؛ مەرگ بڕین ۲. هەڵپلۆسکاندن؛ تەفروتوونا کردن؛ لەناو بردن ۳. کوژاندن؛ کوژاندنەوە؛ دامرکاندن؛ داتەمراندن؛ ئەوەکوشنەی؛ کوشنایوە؛ ئەرەمرنەی. هەروەها: **میراندنی**

■ **صفت فاعلی: میراننده** (مرێنەر)/ **صفت مفعولی: میرانده** (مرێنراو)/ **مصدر منفی: نمیراندن** (نەمراندن)

**میرایی** / mîrāyî/: اسم. ۱. نەمێنی؛ دوخ یا چۆناوچۆنی نەمان ۲. ڕەوتی داکشانی داوێنەی لەرە یان بزووتنی شەپۆلێک ✽ **میرائی**

**میرزا** / mîrzā/: [از عربی/ فارسی]/اسم. [قدیمی] میرزا: ۱. ـها؛ ـیان/ مونشی؛ نویسیار؛ نووسنە ۲. ڕێزناوێک بۆ خوێندەواران بێجگە مەلا ‹میرزا حسین: میرزا حوسەین› ۳. ڕێزناوێک لە پاش ناوی شازادەکان ‹عباس میرزا: عەباس میرزا›.

**میرزابنویس** / mîrzāben(e)vîs ، ـها/: [از عربی/ فارسی]/اسم. [تعریض] میرزابنووس: ۱. نویسیار؛ مونشی ۳. ئەو کەسەی لە نووسینگەدا کاری کەم‌بایەخی لە ئەستۆدایە.

**میرزاقاسمی** / mîrzāqāsemî/: [از عربی/ فارسی/ عربی]/اسم. میرزاقاسمی؛ چێشتێکی ئێرانی تایبەتی ناوچەی گیلانە لە باینجان، تەماتە، هێلکە، ڕۆن، سیر و خوێ دروست دەکرێ و لەگەڵ نان یا کەتەدا دەیخۆن.

**میرزاقشمشم** / mîrzāqašamšam ، ـها/: [از عربی/ فارسی/ از عربی]/اسم. [مجازی، گفتاری] باجی قشەمشەم؛ کەسێک کە زۆر بە خۆدا دێ و بە نابەجێ خۆی گەورە نیشان دەدا.

**میرزاقلمدان** / mîrzāqalamdān ، ـها/: [از عربی/ فارسی/ معرب/ فارسی]/اسم. [گفتاری] هەڕەمووکەر؛ مرۆی باریکەلە کە بە ئینجەوفینجە قسە دەکا.

**میرشکار** / mîršekār ، ـها؛ ـان/: [از عربی/ فارسی] اسم. [قدیمی] میرشکار؛ سەرکردەی ڕاوچیان.

**میرغضب** / mîrqazab ، ـها؛ ـان/: [از عربی/ عربی] /اسم. میرغەزەب؛ جەللاد؛ کاربەدەستی شا و خان بۆ کوشتن و ئازار دانی خەڵک.

**میز** / mîz ، ـها/: [مغولی]/اسم. میز؛ مێز: ۱. تەختەی بە پێچکە بۆ شت لە سەر دانان ۲. کەرستەیەکی وا بە نەختێ جیاوازیەوە بۆ کاری تایبەت ‹میز بیلیارد: مێزی بیلیارد› ۳. [مجازی] پۆست؛ پلە؛ مەقام ٤. [نجوم] وێنەیەکی گەردوونی پچووکە لە نیوەگۆی باشووری ئاسماندا.

▣ **میز اتو**: مێزی ئوتوو؛ مێزێکی باریکەڵە بۆ ئوتوو لە سەر کێشان کە دەنووشتێتەوە.

**میز گرد**: [مجازی] کۆڕ؛ دانیشتنێک بۆ وتووێژ کە هەر کەس بۆی هەیە بە نۆرە بیر و ڕای

خۆی دەربېڕێ.

**میزامپلی** / mîzāmpelî/: [فرانسوی] ☜ **میزانپلی**

**میزان**[1] / mîzān/: [فرانسوی]/اسم. ۱. ـها/ ئەندازە؛ ئەنازە؛ شۆ ‹میزان درآمد شما چقدر است؟: ئەندازەی داهاتتان چەندە؟› ۲. ☜ **ترازو ـ ۲** ۳. ڕەزبەر؛ حەوتمین برجی ساڵ؛ یەکەم برجی پاییز ٤. ـها/ *[موسیقی]* میزان؛ هەر کام لە پاژە زەربیەکانی ئاهەنگێک کە تا دوایی وەک یەک دووپاتە دەبێتەوە ‹میزان دوضربی: میزانی دووزەربی›.

**میزان**[2]: *صفت.* کۆک؛ میزان؛ ڕێک ‹ساعت را میزان کردم، امروز حالم میزان نیست: سەعاتەکەم میزان کرد، ئەمڕۆ کۆک نیم›.

**میزان‌الحراره** / mîzānolharāre ، ـها/: [عربی] /اسم. گەرماپێو؛ دەماپێو؛ قیرات؛ ئامرازی شاندانی پلەی گەرما و سەرما.

**میزانپلی** / mizānpelî, mizānpelî/: [فرانسوی] /اسم. میزامپولی؛ ڕازاندنەوەی قژ بە فڕدان و پێچانەوە: **میزامپلی**

**میزانسن** / mîzānsen/: [فرانسوی]/اسم. میزانسێن؛ کار و ڕەوتی ڕێکخستنی شوێن و ڕێی شانۆیاران و کەلوپەل لە سەر شانۆوە.

**میزبان** / mîzbān ، ـها؛ ـان/: /اسم. ۱. خانەخوێ؛ خاوەن‌ماڵ؛ خانەخوا؛ خانەخوێگ؛ مێڤاندار؛ مازووڤان؛ کەسێ کە یەک یان چەند میوانی بۆ چووە ‹آزاد میزبان ما بود: ئازاد خانەخوێمان بوو› ۲. *[پزشکی]* وەرگر؛ کەسێ کە ئەندامێکی پێوە پەیوەن دەکەن ۳. *[پزشکی]* گیانەوەرێک کە لاکوتی هەیە ٤. *[ورزش]* تیمێک کە لە شاری خۆیدا کایە دەکا.

**میزبانی** / mîzbānî/: /اسم. ۱. مێوانداری: مازووڤانی؛ خاوەن‌ماڵی ۲. کاری بەڕێوە بردنی میوان.

**میزراه** / mîzrāh/: [کردی/ فارسی]/اسم. میزۆک؛ ڕێ‌مێز؛ میزەڕۆ؛ ڕۆگەی میز پێداهاتن لە میزەڵدانەوە تا دەر.

**میزنای** / mîznāy/: [کردی/ فارسی]/اسم. چوچ؛ میزەڕۆ؛ لوولەی میز پێداهاتن لە گورچیلەوە تا میزەڵدان: **میزەنای**

**میزەنای** / mîzenāy/: [کردی/ فارسی] ☜ **میزنای**

**میسر** / moyassar/: [عربی] صفت. بووزخۆر؛ لواو؛ شیاوی دەسکەوتن یان پێگەیشتن. هەروەها: **میسر بودن؛ میسر شدن؛ میسر کردن**

**می‌سی‌سی‌پین** / mîsîsîpiyan/: [انگلیسی]/اسم. می‌سی‌سی‌پیەن؛ پێنجەمین گەڕ لە دەورانی یەکەمی زەویناسی.

**میسیون** / mîs(i)yon ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. لێژنە؛ شاند؛ کۆڕێک بریتی لە چەند کەس کە بۆ کارێکی تایبەت بۆ شوێنێک بەڕێ دەکرێن.

**میسیونر** / mîs(i)yoner ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. میسیۆنیر؛ ئەندامی لێژنەی بەڕێکراو، بەتایبەت ئەو کەسە کە بۆ ڕاگەیاندنی دینی مەسیحی بۆ وڵاتانی دی دەڕوات.

**میش** / mîš ، ـها/: /اسم. مەڕ؛ مەر؛ پەز؛ مێ؛ مێە؛ مێیە؛ میە؛ مێش؛ مهی؛ میهی؛ مەهـ ؛ مەها؛ مەی.

**میش‌مرغ** / mîšmorq ، ـها؛ ـان/: /اسم. مێشەسی؛ چێرگ؛ چرگ؛ باڵندەیەکی زل و قەڵەوی هەڕەمەخۆر، بە لاقی درێژ و ئەستوور و سەر و ملی بۆرەوە کە نێرەکانیان زلترن و هێلێک لە ملیانە.

**میشن** / mîšan/: /اسم. ۱. چەرمی پەز ۲. تیماج؛ تیمانج؛ پێستی خۆش‌کراوی ئاژەڵ بۆ ئاسەری کەوش، کۆت و بەرگی کتێب.

**میشوم** / mîšûm/: [از عربی] ☜ **مشئوم**

**میشی**[1] / mîšî/: /اسم. مێشی؛ ڕەنگی قاوەیی کاڵ کە بۆ زەردی تۆخ دادەگەڕێ.

**میشی**[2]: *صفت.* مێشی؛ بە ڕەنگی قاوەیی کاڵ.

**میعاد** / mî'ād ، ـها/: [عربی]/اسم. وادە؛ ژوان؛

جوان؛ بەڵێندراو ‹روز میعاد؛ جای میعاد: ڕۆژی وادە؛ جێ ژوان›.

**میعادگاه** / mî'ādgāh ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. ژوانگە؛ میرە؛ جێژوان؛ جێگەی پێکگەیین.

**میعان** / maya'ān/: [عربی]/اسم. کار و ڕەوتی ڤەبوهوژین؛ بوونە تەوش؛ لە گاز/ هەڵمەوە بوونە تراو/ ئاو.

**میقات** / mîqāt ، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ژوانگە؛ میرە؛ جێژوان.

**میکا** / mîkā ، ـها/:/اسم. میکا؛ ماکی کانی لە سیلیکاتی ڕەنگی و بێڕەنگ کە پەڕە ــ پەڕەی زۆر ناسکی لێدەردێ و لە پیشەسازیدا بەکەڵکە.

**میکادو** / mîkādo/: [فرانسوی]/اسم. میکادۆ: ١. ناوێ بۆ ئیمپراتوورانی ژاپۆن ٢. جۆرێ شیرینی وشک لە نانی بەستەنی و کاکاهوو.

**میکانیک** / mîkānîk/: [فرانسوی] ☜ **مکانیک**

**میکانیکی** / mîkānîkî/: [فرانسوی] ☜ **مکانیکی**

**میکده** / meykade/ ☜ **میخانه**

**میکرب** / mîkrob ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ١. هوورک؛جانەوەرێ کە بە چاو نابیندرێ ٢. میکرۆب؛ گیانداری یەکجار ورد بەتایبەت ئەوانەی کە دەبنە هۆی نەخۆشی گیانەوەران (وەک باکتری، یەکسیللولی و کارگ) * **میکروب**

**میکرب‌شناسی** / mîkrobšenāsî ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. میکرۆبناسی؛ لقێک لە زانستی ژیناسی کە دەپەرژێتە سەر میکرۆب.

**میکربی** / mîkrobî/: [فرانسوی] صفت. میکرۆبی: ١. سەر بە میکرۆب ‹بیماری میکربی: نەخۆشی میکرۆبی› ٢. میکرۆباوی؛ بە میکرۆب؛ میکروبدار ‹سبزی میکربی: سەبزی میکروباوی›.

**میکرسکپ** / mîkroskop/: [فرانسوی] ☜ **میکرُوسکُپ**

**میکرفن** / mîkrofon/: [فرانسوی] ☜ **میکروفُن**

**میکرن** / mîkron ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. میکرۆن؛ یەکەی درێژایی ئەوەندەی یەک لە ملیۆنی میتر: **میکرومتر؛ میکرون**

**میکروارگانیسم** / mîkro'orgānîsm ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. هوورک؛ زیلە؛ هەر جانەوەرێکی ورد کە بە چاو نەبیندرێت.

**میکروب** / mîkrob/: [فرانسوی] ☜ **میکرُب**

**میکروبیولوژی** / mîkrobiyolojî/: [فرانسوی] /اسم. میکرۆبناسی.

**میکروتم** / mîkrotom/: [؟] ☜ **ریزبُر**

**میکروسکپ** / mîkroskop/: [فرانسوی]/اسم. میکرۆسکۆپ: ١. /ـها/ وردبین ٢. *[نجوم]* کەلوویەک لە ئاسمانی نیوەگۆی باشووریدا * **میکرسکپ؛ میکروسکوپ**

**میکروسکپی** / mîkroskopî/: [فرانسوی] صفت. ١. میکرۆسکۆپی ‹تصویر میکروسکپی: وێنەی میکرۆسکۆپی› ٢. *[مجازی]* وردیلە؛ زۆر ورد.

**میکروسکوپ** / mîkroskop/: [فرانسوی] ☜ **میکرُوسکُپ**

**میکروفن** / mîkrofon ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. میکرۆفۆن؛ دەنگبەر؛ ئامرازێکە شەپۆلی دەنگ بۆ بلاو بوونەوە یان تۆمارکردن، دەکاتە شەپۆلی ئەلکتریکی: **میکرُفن؛ میکروفون**

**میکروفون** / mîkrofon/: [فرانسوی] ☜ **میکروفن**

**میکروفیش** / mîkrofîš ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. میکرۆفیش؛ پەڕەی میکرۆفیلمی، کە وێنەی زۆر وردی دەقێکی لە سەرە.

**میکروفیلم** / mîkrofîlm ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. میکرۆفیلم؛ فیلمی زۆر ورد.

**میکروکامپیوتر** / mîkrokāmpiyoter, -kāmpiyûter ، ـها/: [از انگلیسی]/اسم. میکرۆکەمپیوتەر؛ کەمپیوتەری ئاسایی کە کەرستەی تۆمارکردنی لە ئامرازی یەکجار ورد پێکهاتووە.

**میکرومتر** / mîkrometr/: [فرانسوی]/اسم. ١. /ـها/ میکرۆمیتر؛ ئامێرێک بۆ پێوانی مەودای زۆر کەم، کە دەخرێتە سەر میکرۆسکۆپ و

تەلەسکۆپ ۲. ☜ **میکرۆن**

**میکرون** / mîkron/: [فرانسوی] ☜ **میکرۆن**

**میکروویـــو** / mîkroveyv/: [فرانســـوی] ☜ **مایکرووێو**

**میکولژی** / mîkolojî/: [فرانسوی]/اسم. قارچناسی؛ کارگناسی.

**میگـرن** / mîgren/: [فرانسـوی]/اسم. سەرئاسـێ؛ سەراسـێ؛ شیشـنگ؛ لاژانەسـەر؛ ژانەسـەرێکی تووشی تاوتاوەیـە، نـەخۆش دادەگـرێ و تێکـی دەدا.

**میگسار** / meygosār ، ـها/: اسم. [ادبی] مەیخۆرە؛ کەسێ کە بادە ئەخواتەوە.

**میگســاری** / meygosārî ، ـهـا/: اسـم. [ادبـی] مەیخۆری.

**میگو** / meygû ، ـهـا/: اسم. مـەیگوو؛ ئـەنگوش؛ کێچـی دەریـا؛ جـۆرێ قرژاڵـۆکەی دەپایـە لـە تــیرەی ڕەقپێســتان بــە چنگاڵــی درێــژی دڕکاویەوە.

**میل** / meyl ، ـهـا/: [عربـی]/اسـم. واز: ۱. / امیال/ خواست؛ خواز؛ حەز؛ فز ۲. گـرایش؛ گرەوشـت؛ گریاشت ۳. ئیشتیا؛ کەیف؛ مگێز؛ حـەز؛ گێـول ‹میل به خوردن ندارم: وازم لە خواردن نیە›.

▣ **میــل ترکیــی**: وازی تێکـــەڵاوی؛ گــری تێکئاڵاوی؛ تایبەتمەندی سروشـتی تـوخمی کیمیایی بۆ تێکئاڵان لەگەڵ برێکی‌تردا.

**میل** / mîl ، ـها/: [معرب از لاتینی]/اسم. ۱. سووکە؛ قمشــێ؛ میلــەی باریــک ۲. [پزشـکی] ســۆند؛ ئامرازی لێگەڕان یان هەراوکردنەوەی دەراوێکی لەش: **سَند؛ سوند** ۳. نیشانەی ڕێنموون؛ **مِسـلّه؛ أبلیسک** ٤. [انگلیسی] مایـل؛ یەکـەی مـەودا لـە ئینگلیز و ئەمریکا بەرامبەر بە ۱۶۰۹ میتر: **مایل** ٥. [ورزش] پارچە چێـوێکی گـەورەی دەسـکدار کە لە زۆرخانەدا جووتێکی هەڵدەگرن و لە سەر شان و باسکیان سووری دەدەن.

▣ **میل بافتنی**: سووکەسنگ؛ تەبەنە؛ میلەیـەکی باریک و درێژی کانزایی یـان پەلاسـتیکی بـۆ دەسچن‌کردنی بەن و کاموا.

**میل دریایی**: مایلی دەریـایی؛ یەکـەی مـەودا بەرامبەر بە ۱۸۵۲ میتر.

**میـل سـرمه**: کلچـۆک؛ کلچێـوک؛ میلچـۆک؛ میلچێـوک؛ ملچێـوک؛ مالـگ؛ کـەلچ؛ کلـچ؛ ملچۆک؛ کلچیـو؛ کلچێـو؛ کلچـۆڤ؛ کلچـک؛ کلچۆ؛ میلی چاو ڕشتن؛ ئـەو چێـوە لـووس و باریکە کلی پێ دە چاو دەکێشن.

**میل کاردان** ☜ **میل‌کاردان**

**میل گرد** ☜ **میل‌گرد**

**میـل محـور**: شـافت؛ شـەفت؛ قـورم؛ شڤـک؛ شڤـاک؛ دەسـتک؛ میلەیـەک کـە جوولـەی ماشین لە بەشێکەوە دەداتە بەشێکی‌تر.

▣ **میل زدن**: میلْ دان؛ تیرۆکردنی میل دە نێـو دەراوی لەش بۆ بەردان و هـەراو کردنـەوەی، بەتایبەت میزەڕۆ.

**میلاب** / mîlāb ، ـها/: [معرب/ فارسی]/اسم. ئاونگ؛ لوولەیەکی دارینە لە قلیاندا کە سەرێکی دەنێـو گۆزەڵە ئاودایە و دووکەڵ لە ئاو دەپەڕێنێتـەوە: **آب‌نی**

**مــیلاد** / mîlād/: [عربــی]/اســم. ۱. کــاتی لــە دایک بوون ۲. زایـین؛ کـاتی لـە دایـک بـوونی عیسای مەسـیح کـە دەگاتـە ٦٢١ سـاڵ پـێش لە کۆچ ‹قبل از مـیلاد؛ بعد از میلاد: پـێش زایـین؛ پاش زایین›.

**میلادی** / mîlādî/: [عربی] صفت. زایـینی ‹سال میلادی: سالی زایینی›.

**میلسنگ** / mîlsang ، ـها/: [معرب/ فارسی]/اسم. ئەو گاشـەبەردانە مـرۆی پـێش لـە مێـژوو ڕاسـتی کردوونەوە، بەتایبەت لە ئورووپادا.

**میل‌کاردان** / mîlkārdān ، ـها/: [معرب/ فرانسوی] /اسـم. مـێلْ گـاردان؛ میـل‌کـاردان؛ ئـامێری گواســتنەوەی هێــز لــە گیربوکســەوە بــۆ دیفرنسیاڵ: **کاردان؛ میل گاردان**

**میل‌گاردان** / mîlgārdān/: [معرب/ فرانسوی] ☜ **میل‌کاردان**

**میل گرد** / mîl(e)gerd/: [معرب/ فارسی]/اسم. مێل‌گرد؛ مێلەی لە پۆلا بە ئەستوورایی یەک تا چەن سانتی‌میتر، بۆ ناو بیتون.

**میل‌لنگ** / mîl.lang، ـها/: [معرب/ فارسی]/اسم. مێل‌لەنگ؛ تەوەرە یان مێلەیەکی چەند لایی دە نێو موتوری ماشیندا کە جوولەی هات‌وچۆ دەکاتە سوورانەوە.

**میل‌میلک** / mîlmîlak، ـها/: [معرب/ معرب/ فارسی]/اسم. [نساجی] مێل‌مێلەک؛ دەستە بەن یان سیمی هاوشانی سەر ماشێنی چنکاری کە هەر کام تالێک بان و خوار دەکەن و دەیخەنە سەر چنراوەکەوە.

**میله** / mîle، ـها/: [معرب/ فارسی]/اسم. ١. مێلە؛ میلە؛ پارچەکانزای گرۆڤەری درێژ و باریک ‹میلەی پرچم: میلەی ئالا› ٢. ئەلقە؛ ئالقە ٣. [گیاەشناسی] میلە؛ بەشی وەک دەرزی هەلکشاوی نێرینەی گوڵ.

**میلیارد** / mîl(i)yārd/: [فرانسوی] ☜ **ملیارد**

**میلیاردر** / mîl(i)yārder/: [فرانسوی] ☜ **ملیاردر**

**میلیاردم** / mîl(i)yārdom/: [فرانسوی] ☜ **ملیاردم**

**میلیتاریزم** / mîlîtārîzm/: [فرانسوی] ☜ **میلیتاریسم**

**میلیتاریست** / mîlîtārîst، ـها/: [فرانسوی] صفت. میلیتاریست؛ چەک‌سالار؛ هۆگر و لایەنگری میلیتاریسم.

**میلیتاریستی** / mîlîtārîstî/: [فرانسوی] صفت. میلیتاریستی؛ چەک‌سالارانە.

**میلیتاریسم** / mîlîtārîsm/: [فرانسوی]/اسم. چەک‌سالاری؛ میلیتاریسم: ١. دەسەلاتی چەکداران و ئامانجەکانیان بە سەر کۆمەلگادا ٢. ڕێوشوێنی هەچی بەهێزترکردنی چەکداری و هەلنانیان بۆ مەبەستی سیاسی: **میلیتاریزم**

**میلیشیا** / mîlîš(i)yā/: [لاتینی]/اسم. ١. هێزی چەکداری چریکی ٢. [ـها/] چەکداری چریک.

**میلیگرم** / mîlîg(e)ram، ـها/: [فرانسوی]/اسم. میلی‌گرەم؛ یەکەی پێوانی کێش بەرامبەر بە ٠,٠٠١ی گرەم.

**میلی‌لیتر** / mîlîlîtr، ـها/: [فرانسوی]/اسم. میلی‌لیتر؛ یەکەی پێوانی بارستایی بەرامبەر بە ٠,٠٠١ی لیتر.

**میلیمتر** / mîlîmetr، ـها/: [فرانسوی]/اسم. میلی‌میتر؛ یەکەی پێوانی درێژایی بەرامبەر بە ٠,٠٠١ی میتر.

◙ **میلیمتر مربع**: میلی‌میتری چوارگۆشە؛ یەکەی پێوانی ڕووبەر ئەوەندەی ٠,٠١ی سانتی‌میتری چوارگۆش.

**میلیمتر مکعب**: میلی‌میتری چوارپاڵوو؛ یەکەی پێوانی بارستایی ئەوەندەی ٠,٠٠١ی سانتی‌میتری چوارپاڵوو.

**میلین** / mîyelîn/: [فرانسوی]/اسم. [زیست شناسی] میلین؛ ماکێکی چەوری سپی، چەرمێنەی هێلکەئاسا کە وەک کالان بڕێ دەماری داپۆشیوە.

**میلیون** / mîl(i)yon/: [فرانسوی] ☜ **ملیون**

**میلیونر** / mîl(i)yoner/: [فرانسوی] ☜ **ملیونر**

**میلیونم** / mîl(i)yonom/: [فرانسوی/ فارسی] ☜ **ملیونم**

**میلیونی** / mîl(i)yonî/: [فرانسوی] ☜ **ملیونی**

**میم** / mîm/: /اسم. میم؛ نێوی عەرەبی بیست و هەشتەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**میمنت** / meymanat/: [عربی]/اسم. ممبارەکی؛ موبارەکی؛ بەفەڕی؛ پیرۆزی.

**میمون**[1] / meymûn/: /اسم. مەیموون؛ مەیمووینک: ١. ناوی گشتی بۆ دەستەیەک لە

گواندارنی مرۆ بیچم ٢. نۆهەمین ساڵ لە ساڵانی ڕۆژمێری تورکستانی ☜ **تقویم**
▣ **میمون بیدم:** مەیموونی بێ‌کلک؛ مەیموونی دەست لە پێ درێژتر کە بە پێیان شت دەگرێت (وەک گوریل، شامپانزە و ئوران‌ئوتان).
**میمون دم‌دار:** مەیموونی بەکلک؛ مەیموونی درێژ کە کلکی زۆر بەهێزە و خۆی پێ شۆڕ دەکاتەوە (وەک بووزینە).
**میمون شب:** مەیموونی شەوکار؛ مەیموونێکی دنیای نوێیە بە کلکی ئەستوور و کولکی نەرم و چاوی درشت و سەر و سیمای پانکەڵەی وەک کوندەبوو: **جغدمیمون**
**میمون**[2]: [عربی] *صفت. [ادبی]* موبارەک؛ ممبارەک؛ پیرۆز؛ هەزەخ.
**میمون‌رخ** / meymûnrox ، ـها؛ ـان/: *اسم.* کوندەزێڕە؛ جۆرێک کوندەبووی سەر و سەکەت وەک مەیموونە زۆرتر لە کەلاوە و کۆنەماڵان هێلانە دەکا: **جُغد میمون‌رُخ**
**میمونی** / meymûnî / ☜ گل میمون، **گل**
**میمیک** / mîmîk/: [فرانسوی] *اسم.* میمیک؛ بیچم و شێوەی جووڵانەوەی لەش و بەتایبەت سەر و سیما.
**مین** / mîn ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* لوغم؛ لەخم؛ مین؛ جۆرێ چەکی شەڕە بە شێوەی بەستەیەکی تەقەمەنی کە بە گەرما، دەنگ یان تەوژم دەتەقێتەوە.
**ـ مین** / omîn/: *پسوند.* ـەمین؛ بە ڕزن، ڕیز، پلە یان پێگەی دیاریکراوەوە ‹دهمین: دەهەمین›.
**مینا** / mînā/: [عربی] *اسم.* مینا: ١. کاژی یەکجار ڕەق و بریقەداری سەر ددان کە عاج و ناخی ددان دەپارێزێ ٢. ماکی شووشەیی ڕووناک و ڕەنگامە کە کاشی و کانزای پێ دەڕازێننەوە ٣. کاشی یان کانزای بە مینا نەخشراو ٤. /ـها/ گوڵەمینا؛ گوڵ‌نیشان؛ گوڵەمێشە؛ گوراڵەچەرمە؛ گیایەکی ڕازێنەیی پایا بە گەڵای هێلکەیی هێندێک ئەستوور و گوڵی سپی، پەمەیی یان ئاڵەوە ٥. /ـها/ مەلێکی قاوەیی سەرڕەشی بە کاکۆڵە بە باڵی خێڕخێڕ و دەندووک و پای زەردەوە کە بە جووت دەژی و لاساکەرێکی سەیرە: **مرغ مینا؛ مرغ مقلد**
**مینائی** / mînā'î/: [عربی] ☜ **مینایی**
**میناکاری** / mînākārî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* میناکاری: ١. هونەر یان لێزانی بە کار بردنی ماکی شیشەیی و ڕەنگاوڕەنگ لە سەر کاشی یان کانزا ٢. بەرهەمی ئەو کارە.
**مینایی**[1] / mînāyî/: [عربی] *اسم.* کەوە؛ کەوێ؛ کەوگ؛ کەوو؛ شینی تۆخ: **مینائی**
**مینایی**[2]: *صفت.* ١. کەوە؛ کەوێ؛ کەوگ؛ کەوو؛ بە ڕەنگی ئاوی تۆخ ٢. پێوەندیار یان سەر بە مینا ✻ **مینائی**
**مینچ** / mînč/: [؟] ☜ **مِنچ**
**مین گذاری** / mîngozārî/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* مین‌ڕێژی؛ دانانی لوغم بۆ تەقینەوە بە دوژمندا.
**مینو** / mînû/: *اسم. [ادبی]* ١. بەهەشت؛ بەهشت ٢. ئاسمان.
**مینوت** / mînût ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ڕەشنووس؛ چلکنووس؛ پێش‌نووس.
**مینوی** / mînavî/: *صفت. [ادبی]* ١. بەهەشتی ٢. ئاسمانی.
**مین یاب** / mînyāb ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* مین‌دۆز: ١. ئامرازێک بۆ دۆزینەوەی مینی دەکارکراو ٢. /ـان/ ئەو کەسەی مین دەدۆزێتەوە و لە کاری دەخا.
**مین یابی** / mînyābî/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* مین‌دۆزی؛ کار و ڕەوتی دۆزینەوە و لەکار خستنی مینی دەکارکراو.
**میناتور** / mînyātur, mîn(i)yātor/: [فرانسوی از لاتینی] *اسم.* میناتور: ١. شێوە نیگارکێشیەکی

کـۆنی ولاتـانی ڕۆژهـەلات کـە کتێـب و پەرتووکیان پێدەنەخشاند لە تایبەتمەندیەکانی ئەوەیە دوور و نزیکی تێدا بەدی ناکرێ ٢. /ھا/ نیگارکێشی بەو شێوە.

**مینیـــاتوری** / mîn(i)yātorî, mînyāturî/: [فرانسوی] *صفت. [مجازی]* مینیـاتوری؛ جوانکیلـە؛ زۆر جوان و خونجیلانە.

**مینیاتوریست** / mîn(i)yātorîst, mînyāturîst، ـھا/: [فرانسوی] *اسم.* مینیاتوریست؛ نیگارکێشی مینیاتور.

**مینـیبـوس** / mînîbûs، ـھـا/: [انگلیسـی] *اسم.* مینیبووس؛ پاسی چکۆلە بۆ ١٥ تا ٢٢ مسافر.

**مینــــیژوپ** / mînîjûp/: [فرانســـوی] *اسـم.* مینیژووپ؛ کراس یان داوێنی کولی ژنانـە کـە ناگاتە سەر ئەژنۆ.

**مینیمم** / mînîmom/: [فرانسوی] *اسم.* لانی کـەم؛ لای کـەم؛ مینیمـۆم: ١. کەمینـە؛ کـەمترین و بچـووکترین چەنیـەتی ٢. خـوارترین ڕادەی ڕێپێدراو.

**میو** / mîyow, mîyo:/ *صوت.* مەوژ؛ میاو؛ مێـڕە؛ دەنگی پشیلە.

**میــوپ** / mîyop/: [فرانسـوی] *صـفت. [پزشـکی]* نزیکبین.

**میــوپی** / mîyopî/: [فرانسـوی] *اسم. [پزشـکی]* نزیکبینی.

**میوجات** / mîvecāt/: [فارسی/ از عربی] جمعِ ☜ **میوه**

**میوسـن** / miyosen/: [فرانسوی] *اسم.* میوسـن؛ چـوارەمین خـولی دەورانی سـێهەمی زەویناسی.

**میوکـــارد** / miyokārd/: [فرانســـوی] *اسـم. [کالبدشناسی]* نـاودڵ؛ تـوێژی ناوەنـدی دڵ کـە ئەسـتوورترین تـوێژی دڵـە و لـە شـانەی ماسوولکەیی پێکهاتووە.

**میــوگراف** / miyog(e)rāf/: [فرانســوی] ☜ **ماهیچەنگار**

**میـوه** / mîve، ـھـا/: *اسم.* میوە؛ مێوە؛ میڤـە: ١. /میوجات/ بـەر؛ خـوزار؛ فێقـی؛ فێکـی؛ فیقـی؛ یـەمیش؛ بەشـێ لـە ئەنـدامی گیـا کـە لـە هەلـپێچانی بشـکوژ بـەدیهاتووە ٢. *[مجـازی]* بەرهەم؛ ئاکام.

▣ **میــوه دادن:** بــەر دان: ١. بەرهــەم هێنــان ٢. ئاکام دان.

**میهمان** / mîhmān/ ☜ **مِهمان**

**میهمانی** / mîhmānî/ ☜ **مِهمانی**

**میهن** / mîhan/: *اسم.* ١. نیشتمان؛ زاینگە؛ زێـد؛ زێو؛ ولاتی لە دایک بوون ٢. وەلات؛ ولات؛ زێد؛ ولاتی نیشـتەجێ بـوون ٣. نیشـتمان؛ وەتـەن؛ زێد؛ سەرزەوینێ کە دانیشتووانی پێکەوە زمـان، فەرهەنگ و مێژوویەکی هاوبەشیان هەیـە و لـە سەریەک قازانجن.

**مـــیهن پرســـت** / mîhanparast، ـھـا؛ ـان/: *صـفت.* نیشـــتمانپـەروەر؛ وەتـــەنپەرەســـت؛ وەتــەندۆســت؛ وەتــەنپــەروەر؛ ولاتپــارێز؛ ولاتخۆشەویســـــــــت؛ زێدپەرســـــــــت؛ نیشـتمانپەرەسـت؛ ئاواتـەخوازی پێشـکەوتن و سەربەرزی نیشتمان و هاوولاتیانی.

**مـــیهن پرســـتانه** / mîhanparastāne/: *صـفت.* نیشـــتمانپەروەرانـــە؛ وەتـــەنپەرســـتانە؛ وەتەندۆستانە ‹احساسات میهن‌پرستانه: هەسـتی نیشتمانپەروەرانە›.

**مـــیهن پرســـتی** / mîhanparastî/: *اسـم.* وەتەنپەرستی؛ زێدپەرستی؛ وەتەندۆستی.

**مـــیهن دوســـت** / mîhandûst، ـھـا؛ ـان/: *صفت.* نیشـتمانپـەروەر؛ وەتـەنی؛ وەتـەنپەرسـت؛ ولاتپارێز.

**میهن دوستی** / mîhandûstî/: *اسم.* ولات پارێزی؛ نیشتمان پەرستی؛ نیشتمان پەروەری.

**میهنی** / mîhanî/: *صفت.* نیشتمانی ‹سرود میهنی: سروودی نیشتمانی›.

# ن

**ن / n/:** *حرف.* ن؛ نیشانەی پیتی بیست‌ونۆهەمی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**ن / ne/:** *اسم.* نێ؛ ناوی بیست‌ونۆهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**نـ / na/:** *پیشوند.* نەـ: ١. ـ مە؛ نیشانەی نەبوونی کردار ‹ندیدم؛ نرفت؛ نکن!: نەمبینی؛ نەچوو؛ مەکە!› ٢. نیشانەی چاوگی نەرێنی ‹نیامدن؛ ندیدن؛ ننوشتن: نەهاتن؛ نەدیتن؛ نەنووسین› ٣. *[گفتاری]* نیشانەی ئاوەڵناوی نەرێنی ‹نخورده؛ نشُسته؛ ندیده: نەخوراو؛ نەشۆراو؛ نەبینراو›.

**ـن / an/:** *پسوند.* ــ ن؛ ـ ئەی؛ ـ ش؛ نیشانەی چاوگ ‹دیدن: دیتن›.

**نا¹ / nā/:** *اسم.* ١. *[گفتاری]* هێز؛ وزە؛ توانا؛ برس؛ برست؛ هاز؛ هازی؛ هەرەنگ؛ شنگ؛ گور؛ گریک؛ ستین؛ تاو؛ تین؛ دەگەر؛ قەوەتی لەش ‹من دیگر نا ندارم: ئەمن چیتر هێزم نیە› ٢. بۆسار؛ بۆسارد؛ بۆچاڵ؛ بۆچاڵی؛ بۆمچ؛ بۆمچک؛ بۆمچە؛ بۆمچەو؛ بۆمچەوە؛ بۆگنخ؛ بۆگنخاو؛ نمەبۆ؛ بۆمچەوگ؛ هەفار؛ بۆنی شوێنی شێ گرتوو یان خواردنی کۆن و برش‌هێناو.

▣ **نا نداشتن:** وزە/ هێز تێدا نەمان؛ هێز و توان نەبوون؛ هێز تێدا نەبوون؛ هاز نەبیەی چنە؛ تین و گور نەمان.

**نا-²:** *پیشوند.* ١. زڕ ـــ ؛ زڕە ـــ ؛ هەڵەک ‹نامادری: زردایک› ٢. نا ـ ؛ نە ـ ؛ بێ ـ ؛ پێچەوانەکەرەوەی ناو و ئاوەڵناو ‹ناآشنا؛ نارفته؛ ناآرام: نائاشنا؛ نەڕۆیشتوو؛ بێئۆقرە›.

**ـ نا³:** *پسوند.* ــ بەرە؛ ـ جێ؛ ـ ئایی؛ نیشانەی چۆنیەتی جێ یان دۆخێ ‹تنگنا؛ فراخنا؛ درازنا: تەنگەبەرە؛ هەراوەجێ؛ درێژایی›.

**ناآرام / nā'ārām/:** *صفت.* ١. هار؛ هاج؛ هار و هاج؛ بزۆز؛ سەربزۆک؛ نەویس؛ نەوێست؛ سەربزێو؛ سەرهار؛ نائارام؛ بێقەرا؛ بێئوقرە؛ قاچان؛ هەدانەدەر؛ دانەسەکاو؛ دانەسەکیاگ؛ ئەرەنەکاسیا؛ هولوولی؛ چل‌ــ فلی؛ هەوەنتە؛ نەکامین؛ ئەرەنەمدرا ٢. ئاڵۆز؛ وەڕەز؛ تووڕە؛ ئاشۆ.

**ناآرامی / nā'ārāmî، ـهـا/:** *اسم.* ١. بزۆزی؛ سەربزێوی؛ هاری؛ بێقەراری؛ گڕی‌ــ فڕی؛ کەنەما؛ نائارامی ‹ناآرامی این بچه خسته‌ام کرد: بزۆزی ئەم منداڵە وەڕەزی کردم› ٢. *[مجازی]* بشێوە؛ پاشاگەردانی؛ ئاڵۆزی؛ پشێوی؛ بوونی چۆنیەتیەک کە هێمنایەتی تێک‌بدا ‹برخی مناطق دستخوش ناآرامی شد: بڕێ شوێن تووشی بشێوە بوون›.

**ناآگاه / nā'āgāh/:** *صفت.* تێ‌نەگەیشتوو؛ نائاگا؛ بێئاگا؛ بێ‌خەبەر؛ بێ‌جەی؛ های لە هیچ نا ‹آدم ناآگاه این حرفها سرش نمی‌شود: مرۆی تێ‌نەگەیشتوو

های لەم قسانە نیە›.

**نالمن** / nā'amn/: [فارسی/ عربی] *صفت*. جێ‌خۆف؛ جێ‌مەترسی؛ نەتەکن؛ پڕمەترسی؛ نائەمن؛ بەبێ ئاسایش و هێمنی ‹شهر نالمن بود و خطر انفجار همیشه وجود داشت: شار جێ‌خوف بوو، هەموو دەم مەترسی تەقینەوە هەبوو›.

**نالمنی** / nā'amnî ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم*. نائەمنی؛ بار و دۆخی هەبوونی مەترسی و نەبوونی ئاسایش ‹ بیشتر، جنگ موجب نالمنی می‌شود: زۆرتر، شەڕ دەبێتە هۆی نائەمنی›.

**نالمید** / nā'omîd/: *صفت*. ناهمێ؛ ناهومێد؛ بێ‌هیوا؛ بێ‌هێڤی؛ هیوابڕاو؛ نائومێ؛ خۆبان؛ بێ‌قەر؛ دلسار؛ دلسارد؛ دلسەرد؛ نسک و ناهمێ؛ بەرچاوتاریک ‹خسته و نامید به خانه برگشت: شەکەت و ناهمێ گەڕاوە بۆماڵ›.

▣ **نامید شدن**: دلسارد بوونەوە؛ هیوا بڕان؛ هێڤی بڕان؛ ناهمێ بوون؛ بێ‌هێڤی/ بێ‌هیوا بوون؛ هومێد نەمەنەی.

**نالمیدی** / nā'omîdî/: /*اسم*. ناهومێدی؛ ناهمێدی؛ دلساردی؛ دلسەردی؛ دلساری؛ بێ‌هیوایی؛ بێ‌هێڤیتی؛ هیوابڕاوی ‹نالمیدی به دل راه نده!: ڕێ بە ناهومیدی مەدە!›. هەروەها: **نالمید بودن؛ نالمید کردن**

**نااهل** / nā'ahl ، ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت*. نەشیاو؛ نەشیاگ؛ نەشیا؛ لەونەش ‹شوهرش نااهل است و به حرف کسی گوش نمی‌دهد: مێردەکەی نەشیاوە و گوێی بۆ کەس شل نیە›.

**نائب** / nā'eb/: [عربی] ☜ **نایب**

**نائل** / nā'el/: [عربی] ☜ **نایل**

**ناب**[1] / nāb/: [عربی]/*اسم*. گیرگە؛ کلب؛ کێلب؛ کێلبە؛ کەلب؛ کەلبە؛ کەلوە؛ کەلپ؛ کەلپ؛ کەلم؛ دڕۆک؛ ددانی بەری گیانداران، بەتایبەت گیانداری دڕندە.

**ناب**[2]: *صفت*. بێ‌خەوش؛ پەتی؛ خوری؛ ڕووت؛ بەبێ تێکەڵاوی ‹طلای ناب: زێڕی بێ‌خەوش›.

**ناباب** / nābāb/: [فارسی/ عربی] *صفت*. نالەبار؛ ناباو؛ نەباو؛ ناباب: ۱. بێ‌فرشک؛ ناجۆر؛ نەهێژا؛ تڕۆ؛ پێچ؛ لار؛ گێڕ ‹آدم ناباب: مرۆڤی نالەبار› ۲. نەشیاو لە بواری کۆمەلایەتی و ئاکاریەوە ‹جای ناباب: شوێنی ناباو›.

**نابالغ** / nābāleq/: [فارسی/ عربی] *صفت*. نەگها؛ نابالغ؛ کاڵ و هێشتا پێ‌نەگەیشتوو.

**ناباوری** / nābāvarî/: /*اسم*. بێ‌بڕوایی؛ بێ‌متمانەیی؛ بێ‌ئێتواری ‹حاضران با ناباوری به حرف‌هایش گوش می‌دادند: ئامادەبوان بە بێ‌بڕواییەوە گوێیان بۆ قسەی دەگرت›. هەروەها: **ناباور**

**نابجا** / nābecā/: *صفت*. نابەجێ؛ بێجێ؛ بێجا؛ نابەجا؛ ناڕەوا؛ بێڤا: ۱. لە کات و شوێنی نەشیاودا ‹حرف نابجا: قسەی نابەجێ› ۲. لە شوێنێک بێجگە شوێنی ڕاستەقینەی خۆ ‹ریشەی نابجا: ڕەگی نابەجێ›.

**نابخرد** / nābexrad ، ـان/: *صفت*.*[ادبی]* بێ‌ئاوەز؛ بێ‌یۆل؛ بێ‌عەقڵ؛ هەقمەق؛ هەبلە؛ بلح؛ دەبەنگ؛ گەوج.

**نابخردانه** / nābexradāne/: *قید*. گەوجانە؛ بێ‌ئەقلانە؛ بێ‌ئاوەزانە؛ نەفامانە ‹در این مورد نابخردانه رفتار کرد: لەم بابەتەدا گەوجانە جوولایەوە›.

**نابرابری** / nābarābarî ، ـها/: /*اسم*. نابەرامبەری؛ ناڕێکی؛ ناتەرازی؛ دۆخ یان چۆنیەتی یەکچەشن نەبوونی دوو یان چەند شت لە باری چۆنیەتی یان چەندێتیەوە ‹نابرابری در مقابل قانون: نابەرامبەری لە حاندی قانووندا›.

**نابرادری** / nābarādarî ، ـها/: /*اسم*. برای دایکی/ باوکی؛ برای لە باوک یان دایکەوە جیاواز.

**نابرشته** / nābe ešte/: *صفت*. نەبرژاو؛ نەبرژیاگ؛ نەبریژیا؛ نەورشتە؛ نەبریژیەی.

**نابسامان** / nābesāmān/: *صفت*. نالەبار؛ ناتەواو؛ نەپۆڕ؛ ناحەز و بێ‌سەر و سامان؛ نەمەرزیاگ؛ نەمەرزاو؛ پەرێشان؛ پرژ و بلاو؛ بێ‌سەروبەر؛

بێ‌سەرەو بەرە ‹زندگی نابسامان: ژیانی نالەبار›.

**نابسامانی** / nābesāmānî ، ـها/: اسم. پەرێشانی؛ نالەباری؛ ناتەواوی؛ ئاڵۆزی؛ دانەمەرزیاگی؛ نەمەرزاوی؛ بێ‌سەرەوبەرەیی ‹ارثیەی پدر، او را از نابسامانی نجات داد: میراتی بابی لە پەرێشانی رزگاری کرد›.

**نابغە** / nābeqe ، ـها؛ نوابغ/: [عربی] اسم. بلیمەت؛ بلیمەت؛ ژێهاتی؛ هەڵکەوتوو؛ هەڵکەوتە؛ هەڵکەفتە؛ هەڵکەفتگ؛ هلکەتی؛ بەرکەتی؛ هۆرکەوتە؛ مرۆی خاوەن لێهاتوویی و داهێنەری لەڕادەبەدەر ‹بیشتر مردم ادیسون را نابغە می‌دانند: زۆربەی خەڵک ئیدیسۆن بە بلیمەت دەزانن›.

**نابکار** / nābekār ، ـها؛ ـان/: صفت. [ادبی] خراپکار؛ خراپەکار؛ خاوەن ئاکاری نەگونجاو و نالەبار ‹آن مرد نابکار قدر این فداکاری را نشناخت: ئەو پیاوە خراپکارە بەم لێبوردوویەی نەزانی›.

**نابلد** / nābalad/: [فارسی/ عربی] صفت. نەشارەزا؛ ناشارەزا؛ نابەڵەد؛ نابڵەی ‹آزاد نابلد بود و شهر را نمی‌شناخت: ئازاد نەشارەزا بوو، بە شاری نەدەزانی›.

**نابود** / nābûd/: صفت. تەفروتوونا؛ تەرت‌وتوونا؛ فەوتاو؛ نابوود؛ توونا؛ کلێس؛ بالمیش؛ هەڵلاداد؛ بنەبڕ؛ لەبەین‌چووگ؛ مەحف؛ قەکوداد؛ خەورخەزەو ‹ظرف یک‌ماه همەی ثروتش نابود شد: بە مانگێک هەموو سامانی تەفروتوونا کەوت›.

◘ **نابود شدن:** لەناو چوون؛ تەفروتوونا/ تەرت‌وتوونا کەوتن؛ فەوتان؛ ڤەبڕیان؛ بڕانەوە؛ قڕ تێکەوتن؛ دلێنە شیەی؛ بنەبڕ بوون؛ دە نێو چوون؛ لە بەین چوون؛ نەمان ‹هرچە داشتیم نابود شد: هەرچێکمان هەبوو لەناو چوو›.

**نابود کردن:** لە ناو بردن؛ لە ناودان؛ فەوتاندن؛ لە بەین بردن؛ کامباخ کرن؛ نابوودکردن؛ بنەبڕکردن؛ بەینەنە بەردەی؛ هەشافتن؛ ئەڵتەرەقانن؛ قەلار و سەلار کردن؛ قڕکردن ‹جنگ همە چیز را نابود کرد: شەڕ هەموو شتێکی لە ناو برد›.

**نابودی** / nābûdî ، ـها/: اسم. نابوودی؛ فەوتاوی؛ لە ناو چوویی؛ هەشافتی؛ قڕی؛ نەماوی ‹نابودی جنگل: نابوودی دارستان›.

**نابهنجار** / nābehancār/: [فارسی/سنسکریت] صفت. ۱. نەگونجاو؛ لاداو لە باری ئاسایی ۲. کەل؛ ناتەکووز.

**نابهنجاری** / nābehancārî ، ـها/: [فارسی/ سنسکریت] اسم. نەگونجاوی؛ چۆنیەتی نائاسایی بوون.

**نابهنگام**[1] / nābehengām/: صفت. ناوەخت؛ بێ‌وەخت؛ بێگاڤی؛ بێگاڤ؛ نەک لە کات و باری خۆیدا.

**نابهنگام**[2]: قید. بە ناوەخت؛ بێ‌وەخت؛ بێگاڤی؛ بێگاڤ؛ بە شێوەیەکی نەک لە کات و باری خۆیدا.

**نابینا**[1] / nābînā ، ـها؛ ـیان/: اسم. [ادبی] کوێر؛ کۆر؛ مجرۆ؛ بێ‌چاو؛ حافز؛ کۆرە؛ کۆر؛ نەوین ‹نابینایی عصازنان بە راهی می‌رفت: کوێرێک بە گۆچان‌کوتانەوە بە ڕێگایەکدا دەڕویشت›.

**نابینا**[2]: صفت. [ادبی] کوێر؛ کۆر؛ کۆرە؛ مجرۆ؛ گللی‌کۆر؛ گێلکی‌کۆر؛ نەوین؛ بێ‌چاو؛ گل؛ نەبینا؛ نابینا؛ بێ‌بینایی و سۆمای چاو ‹مرد نابینا: پیاوی مجرۆ›.

**نابینائی** / nābînā'î/ ☜ **نابینایی**

**نابینایی** / nābînāyî/: اسم. کوێری؛ کۆری؛ مجرۆیی: ۱. دۆخ یا چۆناوچۆنی نەدیتن؛ نابینا بوون ۲. موقرایی؛ کوێرایی؛ کۆرایی؛ کوێرایەتی؛ ئامایی؛ کەم و کووڕیەکی لەش کە دەبێتە هۆی نەمانی هەستی دیتن ✻ **نابینائی**

**ناپاک** / nāpāk ، ـها؛ ـان/: صفت. ناپاک؛ نەپاک: ۱. پیس؛ چەپەڵ؛ گەمار؛ چڵکن ۲. [مجازی] بێ‌ناموس؛ شواڵ‌چەپەڵ؛ داوێن‌پیس؛ داوێن‌تەڕ.

**ناپالم** / nāpālm/: [انگلیسی] ☜ بمب ناپالم، **بمب**

**ناپایدار** / nāpāydār/: صفت. نەپا؛ نەپاو؛ بێ‌دەوام؛ خۆنەگر.

**ناپختگی** / nāpoxtegî ، ـها/: *اسم. [مجازی]* کاڵی؛ خاوی؛ بێئەزموونی؛ کاڵ و کرچی؛ چاو نەکراوەیی ‹جوان است و قدری ناپختگی کرده: لاوە و هێندێک کاڵی کردووە›.

**ناپخته** / nāpoxte/: *صفت.* ۱. *[ها/[مجازی]* کاڵ؛ کرچوکاڵ؛ بێئەزموون؛ چاونەکراوە؛ نەگەیشتوو؛ نەگهیشتی ‹جوان ناپختەای بود: گەنجێکی کاڵ بوو› ۲. *[مجازی]* نابەجێ؛ بەبێ لێکدانەوە ‹مراقب باش عمل ناپختەای از تو سر نزند: وریا بە کارێکی نابەجێت لێ نەوەشێتەوە› ۳. کاڵ؛ خاو؛ خاڤ؛ خام؛ نەکولاو؛ کەلی؛ ناتاو؛ نەپوختە؛ نەگریا.

**ناپدری** / nāpedarî ، ـها/: *اسم.* زڕباب؛ باوەپیارە؛ زڕباو؛ زڕباوک؛ مێردی دایک (جگە لە باب).

**ناپدید** / nāpadîd/: *صفت. [ادبی]* ۱. بەرپێوار؛ پێوار؛ داپۆشراو؛ نەدیار؛ نادیار؛ پەنا؛ پەنام ‹ماه در پشت کوه ناپدید شد: مانگ لە پشت کێوەکەوە بەرپێوار بوو› ۲. بزر؛ بەزر؛ ون؛ گم؛ گوم؛ نوخوم؛ نوقم؛ نقم ‹کتابم ناپدید شد: کتێبەکەم بزر بوو›.
هەروەها: **ناپدید شدن؛ ناپدید کردن**

**ـ ناپذیر** / nāpazîr/: *پیوازه.* ـ هەڵنەگر؛ ـ نەخۆر؛ ـ ناپەزێر؛ ـ نەخواز؛ قەبووڵنەکەر ‹چارەناپذیر: چارهەڵنەگر›.

**ناپرهیزی** / nāparhîzî ، ـها/: *اسم.* ناپارێزی؛ ناپارازی؛ گوێنەدەری؛ کار و ڕەوتی خۆ نزیک کردنەوە لە شتێ کە بڤەیە و ئەبێ لێیدوور بێ.

**ناپز** / nāpaz/: *صفت. [گفتاری]* دیرکوڵ؛ نەکوڵ؛ بەکلۆک؛ زۆلک؛ زۆڵە؛ زۆڵەک ‹این گوشت خیلی ناپز است: ئەم گۆشتە زۆر دیرکولە›.

**ناپسری** / nāpesarî ، ـها/: *اسم.* نەوسی؛ نەڤس؛ نەڤسی؛ گوردە؛ کۆڵەوەس؛ کۆڵەبەس؛ کۆڵەبەست؛ زڕکوڕ؛ کوڕهلی؛ کوڕهەوێ؛ هەوێزا؛ هەنەزا؛ هەنەزاگ؛ هەنازا؛ کوڕی ژن بۆ زڕبابی یان کوڕی پیاو بۆ باوەژنی.

**ناپسند** / nāpasand/: *صفت.* ناحەز؛ نەڕند؛ خراو؛ ناڵەبار؛ ناشیرین؛ خووز؛ ناپەسەن؛ نەباش؛ ناپەسەند؛ هەڵهەڵە؛ نەشیاو؛ دڵنەخواز؛ نەچێ؛ نەهێژ؛ نەتوهاوە ‹کار ناپسند: کاری ناحەز›.

**ناپیدا** / nāpeydā/: *صفت.* ۱. نادیار؛ نەدیار؛ بەرپێوار؛ پێوار؛ نەپەندی؛ نەپندی؛ نەپەنی؛ ئاوا؛ ون؛ پەنا؛ پەنام؛ نەخویا؛ خێف؛ ناپەیا؛ کیس؛ نەدیو؛ نەئاشکرا؛ بە جۆرێک چاو نەیبینێ ۲. گوم؛ وندا؛ وەندا؛ شرت؛ بزر؛ بەزرە؛ نهێن؛ بە شێوەیەک دەستی پێ نەگا.

**ناپیدائی** / nāpeydā'î/ ☜ **ناپیدایی**

**ناپیدایی** / nāpeydāyî/: *اسم.* نادیاری: ۱. پێواری؛ چۆناوچۆنی دیار نەبوون یا شاراوە بوون ۲. دۆخ یان چۆنیەتی لە بەردەستدا نەبوون * **ناپیدائی**

**ناتاب** / nātāb/: *صفت.* خاو؛ بانەدراو؛ بانەدریاگ؛ وانەدریا؛ نەموون؛ نەڕێساو؛ نەڕێسیاگ ‹نخ ناتاب: بەنی خاو›.

**ناتراز** / nātarāz/: *صفت.* نارێک؛ نابار: ۱. لار؛ گێر؛ وێڕ؛ ناتراز ۲. *[مجازی]* ناهەموار؛ بە کەند و کلۆ؛ چام ـ چام؛ ناخار؛ بەرز و نزم ۳. *[مجازی]* ناڵەبار؛ پرووز؛ پرۆز؛ بێکێس؛ خێوی ئاکاری نابار و ناحەز ‹آدم ناتراز: مرۆڤی ناڵەبار›.

**ناتراوا** / nātarāvā/: *صفت.* بە تایبەتمەندی یا هێزی خۆگری لە بەرانبەر دزەکردنی نمەوە.
هەروەها: **ناتراوایی**

**ناتریم** / nāteryom/: [فرانسوی/ انگلیسی] ☜ **سدیم**

**ناتمام** / nātamām/: [فارسی/ عربی] *صفت.* نیوەچڵ؛ نیمەچڵ؛ نیڤەچڵ؛ نیمەکارە؛ ناتەواو؛ ناتواو؛ نیمچە؛ نیڤە؛ نیڤچە؛ ناتەمام؛ دوایی نەهاتگ؛ دماناما ‹کار ناتمام: کاری نیوەچڵ›.

◻ **ناتمام گذاشتن:** دوایی نەهێنان؛ ناتەواو هێشتن؛ نیوەچڵ هێشتن؛ نیمەچڵ ئاستەیوە؛ بە نیوەچڵی جێ هێشتن؛ نیمەکارە هێشتنەوە.

**ناتنی** / nātanî/: *صفت.* ۱. ناتەنی؛ برا یا خوشک

لە لانی تەنیا باب یان دایکەوە‹برادر ناتنی: برای ناتەنی› ۲. زڕ؛ هەلی؛ حەلی؛ هەلەک؛ مندالی مێرد یان ژن لە هاوسەرێکی دی ‹پسر ناتنی: زڕ کوڕ› ۳. زڕ؛ خزمی باوەژن یان زڕباب ‹خالەی ناتنی: زڕ پوور› * بەرانبەر: **تنی**

**ناتو** / nātow, nāto: / ـها/: *صفت. [گفتاری]* ۱. نەساز؛ گڕووگر؛ بیانووگیر؛ ڕکن ۲. گزیکار؛ فێڵباز؛ داوباز؛ نارێک؛ ناحەساو.

**ناتوان** / nātavān/: *صفت.* ۱. ناتەوان؛ لێنەوەشاوە؛ نزم؛ کولافە؛ بەبێ لێهاتوویی ۲. بێهێز؛ کوش؛ بێتابشت؛ بێتاقەت؛ ناتەوان؛ بێتین؛ بێتان؛ بێوزە؛ بێزۆر؛ کەمتین؛ بێتۆش؛ نزگبڕیای؛ بێقەوەت و تەکان ‹دست و بازوی ناتوان: باسک و پەنجەی بێهێز› ۳. *[مجازی]* هەژار؛ نەدار؛ دەستەنگ؛ کەمدەست؛ بێدەس؛ دەس نەڕۆیشتوو؛ کەمدەس؛ بێدەسەلات.

**ناتوانی** / nātavānî ، ـها/: *اسم.* ناتەوانی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی بێدەسەلات و کەمتابشت بوون ۲. بێهێزی؛ بێزۆری ۳. هەژاری؛ دەستەنگی؛ کەمدەستی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی دەسکورت و نەدار بوون.

**ناتورالیست** / nāturālîst ، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* سروشتخواز؛ ناتورالیست؛ لاگر و خوازیاری سروشت.

**ناتورالیستی** / naturalîstî/: [فرانسوی] *صفت.* سروشتخوازانە؛ ناتورالیستی.

**ناتورالیسم**/ naturalîsm/: [فرانسوی] ☜ **طبیعتگرایی**

**ناجنس** / nācens ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بەدڕەسەن؛ ناجنس؛ ناکلۆکار؛ کانج؛ ئاکارچەوت.

**ناجنسی** / nācensî ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* بەدڕەسەنی؛ ناجنسی؛ ناکلۆکاری؛ کانجی؛ ئاکارچەوتی.

**ناجوانمرد** / nācavānmard /: *اسم.* ناکەس؛ نامەرد؛ ناپیاو؛ نادروس؛ بە ئاکاری دوور لە مرۆڤایەتی.

**ناجوانمردی** / nācavānmardî ، ـها/: *اسم.* ناکەسی؛ ناپیاوی؛ نامەردی؛ ناپیاگی؛ نادروسی؛ ئاکاری دوور لە مرۆڤایەتی.

**ناجور** / nācûr/: *صفت. [گفتاری]* ناجۆر: ۱. نەخونجاو؛ نارێک؛ گەنگیر؛ نەڤێککەتی ‹رنگهای ناجور: ڕەنگی ناجور› ۲. خراپ؛ گەن؛ بە دۆخ و چۆنیەتیەکی نابارەوە ‹غذای ناجور: خواردنی ناجۆر› ۳. ناحەز؛ نەگەویس؛ دلنەخواز ‹حرف ناجور: قسەی ناحەز›.

**ناجی** / nācî ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* ڕزگارکەر؛ نەجاتدەر؛ ڕزگاریدەر.

**ناچار** [1] / nāčār/: *صفت.* ناچار؛ نەچار؛ مەجبوور؛ ناعەلاج؛ دەستەوستان؛ دەستەوسان ‹ناچار بودم پیشنهادش را بپذیرم: ناچار بووم مل بۆ پێشنیارەکەی کەچ کەم›.

**ناچار** [2]: *قید.* لە ناچاری؛ ناچار؛ چاری ناچار؛ دە ناچاریدا؛ ناچاریەنە؛ لە ناعیلاجی ‹ناچار همسایهها را خبر کردم: لە ناچاری هاوسێکانم ئاگادار کرد›.

**ناچاری** / nāčārî/: *اسم.* ناچاری؛ نەچاری؛ ناعیلاجی؛ مەجبووری؛ حاڵ و چۆنیەتی نەبوونی ڕێکار بۆ جێبەجێکردنی گیر و گرفت ‹همەی این کارها از روی ناچاری بود: ئەم کارانە هەموو لە ڕووی ناچاریەوە بوون›.

**ناچیز** / nāčîz/: *صفت.* نەتشت: ۱. زۆرکەم؛ نەهیچ؛ فرەکەم؛ هندک ‹مقداری ناچیز: هەندێکی زور کەم› ۲. گچکە؛ ویکلە؛ پچەک؛ بەرنەکەتی؛ زۆر بچووک ‹ذرەی ناچیز: وردکەی گچکە› ۳. بێبایەخ؛ بێنرخ؛ مەراش؛ دزگین؛ ناخێر؛ هەرچی ‹شغل ناچیز: کاری بێبایەخ›.

**ناچیزی** / nāčîzî/: *اسم.* ۱. کەمی؛ هندکی ۲. گچکەیی ۳. بێنرخی؛ بێبایەخی.

**ناحساب** / nāhesāb/: [فارسی/ عربی] *صفت.*

*[گفتاری]* بێ‌جێ؛ چەوت؛ ناڕاست؛ نادروست؛ ناڕێک؛ ناحەساو ‹اگر حرف ناحساب می‌زنم بگو: ئەگەر قسەی بێ‌جێ ئەکەم بێژە›.

**ناحسابی** / nāhesābî/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ۱. بێ‌ڕێ‌وجێ؛ ناحەساوی؛ نامـاقووڵ ‹حرف ناحسابی: قسەی بێ‌ڕێ‌وجێ› ۲. *لـ‌ها/[مجازی]* هەرچی؛ تخل؛ هەرچی- پەرچی؛ هیچ و پووچ؛ بێ‌بایەخ ‹آدم ناحسابی: مرۆڤی هەرچی›.

**ناحق** / nāhaq/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* ناحەق: ۱. ناڕاست؛ چەوت ‹حرف ناحق: قسەی ناڕاست› ۲. ناڕەوا؛ نەشیاو ‹خون ناحق: خوێنی ناڕەوا›.

**ناحیه** / nāhîye، ـها/: [عربی]/*اسم.* ۱. */نواحی/* ناوچە؛ ناڤچە؛ ناوان؛ ناو؛ هەرێم؛ مەڵبەند؛ ڤاچ؛ کاڤار؛ سنجەق؛ محال؛ مەحاڵ؛ بەشێکی شینبەر لە وڵات، سەرزەوی یان شارێک ‹ناحیەی تجاری: ناوچەی بازرگانی› ۲. لا؛ شوێن؛ بەشێک لە لەش ‹در ناحیەی سر شکستگی دیده می‌شود: لە لای سەرەوە شکاوی دیارە› ۳. لایەن؛ لا؛ ئالی؛ شوێنی ئاماژە پێ‌کراو ‹صدا از ناحیەی شمال بود: دەنگ لە لایەن باکوورەوە بوو›.

**ناخدا** / nāxodā، ـها؛ ـیان/: *اسم.* ناخودا؛ ناخوا: ۱. کەشتیڤان؛ کەشتیوان؛ کەشتیەوان؛ پاپۆڕوان؛ پاپۆڕەوان؛ ناوەوان؛ گەمیوان؛ گەمیوان؛ گەمیەوان؛ خەفتان؛ کەسێ کە کەشتی دەئاژوێ ۲. *[نظامی]* سەرهەنگی هێزی دەریایی.

**ناخدائی** / nāxodā'î/ ☜ **ناخدایی**

**ناخدایی** / nāxodāyî/: *اسم.* ناخودایی: ۱. کەشتیوانی؛ کاری کەشتیوان ۲. *[نظامی]* پلەی ناخودا لە هێزی دەریاییدا ✽ **ناخدائی**

**ناخشنود** / nāxošnûd/: *صفت.* زویر؛ زوێر؛ زوور؛ زیز؛ ناڕازی؛ ناقایل.

**ناخشنودی** / nāxošnûdî، ـها/: *اسم.* زویری؛ زوێری؛ زووری؛ زیزی؛ ناڕەزایی؛ ناقایلی.

**ناخلف** / nāxalaf، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ناخەڵەف؛ کولێرەحەرام؛ خاوەن ئاکار و ڕەوشتی دژ بە ئاکاری داک و باب و زۆرتریش نەشیاو.

**ناخن** / nāxon، ـها/: *اسم.* نینۆک؛ نەینوک؛ نەنووک؛ نینک؛ نانووخ؛ نانوخ؛ ناخوو؛ ناخون؛ ناخوێن؛ ناخن؛ ناخوون؛ ناخووین؛ نوخان؛ نۆخان؛ نخان؛ نووخەن؛ چکر؛ چنجرۆک؛ ماکێکی ڕەق و بریقەدارە لە پشتی قامکی مرۆڤ و زۆربەی مۆرغەدارانەوە دەردێ.

▣ **ناخن بند کردن**: چنگ گیردان: ۱. *[مجازی]* دەس بەن‌کردن؛ چنگ بەن‌کردن؛ گەیشتن بە داهات یان دۆخێکی باش و شیاو ۲. *[مجازی]* تەڵەکەکردن؛ بە گزی و زمان‌لووسی پارە دەرهێنان.

**ناخن گرفتن**: نینۆک/ چکر گرتن؛ نانووخ/ ناخوون/ ناخوێن‌کردن؛ ناخوون‌کەردەی.

**ناخن‌خشک** / nāxonxošk, -xošg، ـها/: *صفت.* *[گفتاری]* چکووس؛ چکوود؛ چرووک؛ ڕژد؛ نەنووک‌هیشک؛ ڕەزیل؛ لەچەر؛ دەس‌وشک؛ وشکەهەوەر؛ دەس‌قووچاو.

**ناخنک** / nāxonak/: *اسم.* ۱. ناخونە؛ ناخونەک؛ لەکەی باریک و سوور کە لە سەر سپیلکەی چاو پەیدا دەبێ و بەرەو ڕەشایی چاو دەکشێ ۲. *[پزشکی]* بن‌نینۆک؛ ناخوونەک؛ دۆخ یا ڕەوتی گەورە بوونی نائاسایی سووچی نینۆکی پێ کە دەچەقێتە گۆشتی ئەنگوستی تەنشتیدا ۳. نوقورچک؛ ناخونەک؛ کاری هەڵگرتن و ڕفاندنی هەندێکی کەم لە شتێ، بەتایبەت خواردەمەنی.

▣ **ناخنک زدن**: نوقورچک‌گرتن؛ کول لێدان؛ کەف لێدان؛ ناخونەک دان؛ بەبێ ئیجازە لە شتێ خواردن.

**ناخنگیر** / nāxongîr، ـها/: *اسم.* ناخونگر؛ ناخوێنگیر؛ ناخوونگیر؛ نەنووک‌بڕ؛ چکرگر؛ نەنووک‌گر؛ کەرەسەیێ بۆ قرتاندن و کوڵ‌کردنەوەی سەری نینۆک.

**ناخواسته / nāxāste/**: *صفت.* نەخوازراو؛ نەخوازاو؛ نەخوازیاگ؛ بێویست و وازی کەسێ ‹مهمان ناخواسته: میوانی نەخوازراو›.

**ناخوانده / nāxānde/**: *صفت.* ۱. لاپلار؛ خۆرە؛ لەگام؛ نانۆ؛ مووس؛ لایواز؛ داوەتنەکراو؛ بانگنەکراو ‹میهمان ناخوانده: میوانی لاپلار› ۲. *[ادبی]* نەخوێنراو؛ نەخوێندراوە نەخاندی.

**ناخواهری / nāxāharî** ، ـها/: *اسم.* زڕخوشک؛ خوشکی ناتەنی؛ خۆشکی لە دایک یا باببێکی‌تر.

**ناخودآگاه[1] / nāxodāgāh/**: *اسم.* ناوشیار؛ ناهۆشیار؛ ئەو بەشە لە بیر و هۆش کە کار و کردەوەی لە ژێر ڕکێفی مرۆدا نیە (وەک هەڵەی زارەکی یان خەو دیتن).

**ناخودآگاه[2]**: *قید.* بە خۆوە؛ خۆ بە خۆوە؛ هەروا بە خۆوە؛ بەبێ بیرکردنەوە و ویستی پێشەکی ‹ناخوداگاه دست بردم و یکی را برداشتم: بە خۆوە دەستم برد و یەکێکم هەڵگرت›.

**ناخوش / nāxoš/**: *صفت.* ۱. /ـها/ نەخۆش؛ نەخوەش؛ نەوەش؛ بیمار؛ ناساز؛ ناساق؛ ناساخ؛ لەش‌بەبار ‹پسرم ناخوش است: کوڕەکەم نەخوشە› ۲. ناحەز؛ ناگەوار؛ ناخۆش؛ بە چۆنیەتیەکی پێچەوانەی دڵخواز ‹بوی ناخوش: بۆنی ناخۆش›.

**ناخوشی / nāxošî/**: *اسم.* ۱. /ـها/ نەخۆشی؛ نەوەشی؛ لەش‌بەباری ‹گرفتار ناخوشی سختی شدم: تووشی نەخوشیەکی پیس بووم› ۲. ناخۆشی؛ ناخوەشی؛ ناوەشی؛ ناگەواری؛ تاڵی ‹در خوشی و ناخوشی کنار هم بودیم: لە خۆشی و ناخوشیدا لەپاڵ یەک بووین›.

▣ **ناخوشی گرفتن**: نەخۆشی‌گرتن؛ نەوەشی گیرتەی؛ نەوەشی یاوەی لا ‹نمی‌دانم این ناخوشی را از کی گرفتم: نازانم ئەم نەخوشیەم لە کێ گرتووە›.

**از ناخوشی بلند شدن**: هەستانەوە؛ خۆشەوە بوون؛ خوەشەو بوون؛ چاک بوونەوە؛ خاسەو بوون؛ هۆرسەیوە؛ لە نەخۆشی ڕزگار بوون.

**نادار / nādār/**: *صفت.* نەدار؛ هەژار؛ فەقیر؛ دەستەنگ؛ دەس‌نەچوو؛ بەلەنگاز؛ دەسکورت ‹همسایه‌مان نادار بود: هاوسێکەمان نەدار بوو›.

**نادان / nādān** ، ـها؛ ـان/: *صفت.* هشتاری؛ نەزان؛ نازان؛ نیازان؛ نایان؛ نایو؛ نەشکەفتە؛ تێ‌نەگەیشتوو؛ جاهیل؛ دوورەزانست؛ چەتلەمەر؛ نەفام؛ بێئاگاداری و زانیاری پێویست بۆ ژیان‌بەڕێوە بردن ‹دوست نادان: دۆستی نەزان›.

**نادانسته / nādāneste/**: *قید.* بێ‌ئاگا؛ بێخەبەر؛ بێ هەوال ‹مبادا نادانسته کاری بکنی: نەکا بێ‌ئاگا کارێ بکەی›: **ندانسته**

**نادانی / nādānî** ، ـها/: *اسم.* نەزانی؛ نایانی؛ نیازانی؛ نەفامی؛ ناخەلەگی؛ بێ‌هایی ‹خودستایی نشانه‌ی نادانی است: خۆهەڵکێشان نیشانەی نەزانیە›.

**نادختری / nādoxtarî** ، ـها/: *اسم.* کچ‌هلی؛ کچ‌حەلی؛ زڕکەچ؛ زڕکچ؛ کچی ژن بۆ زڕباب یان کچی مێرد بۆ باوەژن.

**نادر / nāder/**: [عربی] *صفت.* دەگمە؛ دەگمەن؛ کەم‌وێنە؛ نایاب؛ نایەب ‹چنین دوستانی نادر هستند: ئاوەها یارانێک دەگمەنن›.

**نادرست / nādorost/**: *صفت.* نادروست؛ نادرووس؛ چەوت: ۱. ناتاو؛ کەم‌وکووڕ؛ شکەستی؛ عەیبەلۆ؛ هەڵە ‹روش نادرست: شێوازی نادروست› ۲. /ـها/ لار؛ سەرچەوت؛ ناحەساو؛ فێڵباز؛ ناهاڵ؛ ناهال؛ خاوەن ئاکاری پێچەوانەی ڕاستی و دروستی ‹آدم نادرستی بود، رشوه می‌گرفت: کابرایەکی لار بوو، بەرتیلی دەخوارد›.

**نادرستی / nādorostî** ، ـها/: *اسم.* نادروستی؛ نادرووسی؛ دەغەڵی؛ ناڕاستی؛ ناڕاسی؛ چەوتی؛ چەفتی؛ لاری.

**نادرویش / nādarvîš** ، ـان/: *اسم.* نادەروێش؛ دەورێشی فێڵباز.

**نادره / nādere** ، ـها/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* بێ‌هاوتا؛ بێ‌تا؛ دەگمە؛ دەگمەن؛ نایاب.

**نادم / nādem** ، ـان/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]*

پەشیمان؛ پەشیوان؛ پەژیوان؛ پۆشمان؛ پاشگەز؛ ژووڤان؛ ژیوان؛ پژمان ‹از رفتار خویش نادم بود: لە کردەوەی خۆی پەشیمان بوو›.

**نادیدنی** / nādîdanî ، ـها/: *صفت.* ١. نەدیتراو؛ نادیار؛ بەرپێوار؛ بەبێ ئیمکان یان چۆنیەتی پێویست بۆ بینین ٢. نەشیا بۆ دیتن.

**نادیده**[1] / nādîde ، ـها/: *صفت.* نەدیتراو؛ نەبینراو؛ نەدیتوو؛ نەبینیو؛ نەدیو؛ نەدیدە ‹دوست نادیده: دۆستی نەدیتراو›.

**نادیده**[2]: *قید.* نەبینراو؛ نەدیتوو؛ نەدیتە؛ نەدیدە؛ نەدیتراو؛ نەبینە؛ نەدیە؛ چاوبەستە؛ بێ چاو پێ‌کەوتن ‹چطور می‌شود چیزی را ندیده پسندید؟!: چۆن دەبێ شتێک نەبینراو پەسەند بکرێ؟!›.

▣ نادیده گرفتن: ١. بواردن؛ چاوپۆشین؛ چاو لێ‌قووچاندن ‹آن پول را نادیده گرفت: لەو پارەیە بوارد› ٢. بە هیچ نەگرتن؛ بایەخ نەدان؛ نەگرتنە بەر چاو؛ بە هیچ نەزانین؛ بە هیچ زانین؛ لە بەر چاو نەگرتن ‹توصیەی مرا نادیدە گرفت: ڕاسپاردەکەمی بە هیچ نەگرت›.

**ناراحت** / nārāhat/: [فارسی/ عربی] *صفت.* نارەحەت: ١. ناخۆش؛ بێ دۆخ یان هێزی دڵخۆش کردن ‹جای ناراحت: شوێنی ناخۆش› ٢. جارز؛ جارس؛ وەڕەز؛ عاجز؛ حێجز؛ زیز؛ زیر؛ زوور؛ زویر؛ زڤیر؛ زوویر؛ گیانەسەر؛ تووشی گوشار و ئازار ‹در آنجا ناراحت بودم: لەوێ جارز بووم› ٣. لەچەر؛ خێوی تایبەتمەندی یان چۆنیەتی ئازاردەری ‹کفش ناراحت: پێڵاوی نارەحەت› ٤. *[مجازی]* بشێونە؛ شێونەر؛ شێوەژنە؛ حێدز ‹جوانی ناراحت و اهل جار و جنجال بود: گەنجێکی بشێونە و هەرا و هوریاکەر بوو›.

هەروەها: **ناراحت بودن/ شدن/ کردن**

**ناراحتی** / nārāhatî ، ـها/: *اسم.* [فارسی/ عربی] نارەحەتی: ١. زیزی؛ زویری؛ زوێری؛ پەشێوی؛ پەرۆشی؛ لێوبەباری ‹ناراحتی شما از چیست؟: هۆی زیزی ئێوە چیە؟› ٢. *[مجازی]* نەخۆشی؛ نەخوەشی؛ نەوەشی ‹ناراحتی عصبی: نەخۆشی دەماری›.

**ناراضی**[1] / nārāzî ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* *[سیاست]* نارازی؛ کەسێ کە دژی ڕژیم یان دەوڵەتە بەڵام شەڕ ناکا ‹یک ناراضی مصری اظهار داشت...: نارازیەکی میسری ڕایگەیاند...›.

**ناراضی**[2]: *صفت.* زویر؛ زوێر؛ زوور؛ زیز؛ زیر؛ نارەزا؛ نارازی؛ ناقایل؛ تووڕە؛ لووتخوار؛ قەڵس ‹پیدا بود که از پیشنهاد من ناراضی است: دیار بوو لە پێشنیارەکەی من زویرە›.

**ناربن** / nārbon/: *اسم.* نالبێر؛ بنەنار؛ بنەهەنار؛ دارنار؛ دارهەنار؛ هەنارێر؛ داری هەنار.

**نارس** / nāras ، ـها/: *صفت.* کاڵ؛ نەگەیشتوو؛ نەیاوا: ١. نەگەییو؛ کالک؛ خاو؛ خرچ؛ کرچ ٢. پێ‌نەگەیشتوو؛ چلمەلەتە ‹نوزاد نارس: ساوای کاڵ›.

**نارسا** / nārasā, nāresā/: *صفت.* ناتەواو؛ کەموکووڕ؛ بکێماسی؛ بێ‌هێز و پێز یان پێداویستی‌تر بۆ دابین‌کردنی مەبەست ‹بیان نارسا: وتەی ناتەواو›.

**نارسائی** / nārasā'î, nāresā'î/ ☜ **نارسایی**

**نارسانا** / nārasānā, nāresānā ، ـها/: *صفت.* نەگەیێنەر؛ بەرگرە؛ بەربەستکەر؛ دابڕکەر؛ عایق؛ بە تایبەتمەندی بەرگری لە بڵاوەکردن، دەردان و دەڵانی شتێ. هەروەها: **نارسانایی**

**نارسایی** / nārasāyî, nāresāyî ، ـها/: *اسم.* ناتەواوی؛ کەموکووڕی: ١. چۆنیەتی تەواو نەبوون، لە باری: *الف)* ئاوەز یان ئاکارەوە *ب)* کورتی و نەبوونی پێداویستی *ج)* نەبوونی وزە و توان لە لەشدا ٢. دۆخ یان چۆنیەتی نەبوونی هەڵومەرج ✱ **نارسائی**

**نارسیسیسم** / nārsîsîsm/: [فرانسوی]/*اسم.* *[روان‌شناسی]* خۆپەسندی؛ خۆویستی؛ وازی لە ڕادەبەدەر بە خۆ و خۆ یەکجار بە باشتر زانین.

**نارضائی** / nārezā'î/: [فارسی/ عربی] ☜ **نارضایی**

**نارضامندی** / nārezāmandî ، ـها/: [فارسی/ عربی/ فارسی]/اسم. نارەزایی؛ نارەزامەندی.

**نارضایتی** / nārezāyatî/: [فارسی/ از عربی] ☜ **نارضایی**

**نارضایی** / nārezāyî ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. زوێری؛ زویری؛ زووری؛ نارەزایی؛ نارەزایەتی؛ ناقایلی ‹این کارها باعث نارضایی مردم می‌شود: ئەم کارانە دەبنە هۆی زویری خەڵک›: **نارضایتی** [گفتاری]؛ **نارضائی**

**نارفیق** / nārafîq/: [فارسی/ عربی]/اسم. نارەفیق؛ نەیار؛ زڕدۆس؛ دۆستی درۆینە و ئاوژێرکا.

**نارکوتین** / nārkotîn/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] نارکوتین؛ بەرهەمێکی ئالکالوئیدی تریاکە بۆ تاو برین و کۆخە سرەواندن بە کار دەبرێ.

**نارگیل** / nārgîl ، ـها/: اسم. نارگیل؛ گوێزهیندی؛ کەشکووڵ: ١. دارێکی بەرزی نەخل‌ئاسای گەرمیانیە ٢. گوێزەهیندی؛ بەری ئەو دارە کە میوەیەکی هێلکەئاسای زۆر گەورەی بە پێستی ڕەق و ریشاڵێکی زۆر دەورەگرتووە. گۆشتەکەی سپیە و ئاوێکی هێندێک شیرین و زۆر بەقوەوەتی تێدایە.

**نارگیلی** / nārgîlî/: صفت. نارگیلی؛ گوێزهیندی؛ بە نارگیل یان بۆنی نارگیلەوە ‹شیرینی نارگیلی: شیرینی نارگیلی›.

**نارنج** / nārenc ، ـها/: اسم. نارنج؛ نارینج: ١. داری نارنج؛ دارێکی لە تیرەی مزرەمەنی بە گوڵی پێنج‌بەشی و پەرچەمی کورتەوە ٢. بەری ئەو دارە کە میوەیەکی گەورە، خڕ، ئاودار و ترشە، بە ڕەنگی زەردی مەیلەو سوور.

**نارنجستان** / nārencestān ، ـها/: اسم. ١. باخەنارنج؛ باخی نارنج ٢. [قدیمی] گوڵخانە.

**نارنجک** / nārencak ، ـها/: اسم. نارنجەک؛ نارنجۆک؛ قومبولە؛ قونبولە؛ قومبەرە؛ ڕوممانە؛ رومانە؛ تەنێکی گچکەی پڕ لە ماکی تەقینەوەیی یا کیمیاویە کە بە دەست یان بە نارنجۆک‌هاوێژ دەهاوێژرێ.

**نارنجک‌انداز** / nārencak'andāz ، ـها؛ ـان/: اسم. نارنجۆک‌هاوێژ؛ قومبولەهاوێژ: ١. سەربازێ کە خستنی نارنجۆکی لە ئەستۆدایە ٢. جەنگامێرێ وەک تۆپێکی بچووک، تایبەتی هاویشتنی نارنجۆک.

**نارنجی** [1] / nārencî/: اسم. نارنجی؛ نارووجە؛ هەر ڕەنگێکی نێوان سوور و زەرد.

**نارنجی** [2]: صفت. نارنجی؛ بەڕەنگی نارنج؛ نارنجی ڕەنگ.

**نارنگی** / nārangî, nārengî ، ـها/: اسم. لالەنگی؛ نارنگی: ١. داری لالەنگ؛ دارێ لە تیرەی مزرەمەنی بە گەڵای باریک و درێژ و بەری خڕەوە ٢. لالنەگ؛ مێوەی ئەو دارە کە خۆراکێکی خڕ، بۆنخۆش و وەک پرتەقاڵ و نارنج نەرم و شیرینە.

**نارو** / nārow, nāro:/: اسم. [گفتاری] ١. هەوقە؛ هەنگ؛ فێڵ؛ گزی؛ زیچک؛ گزە؛ ڕاو؛ ئەروەند؛ بەزاج؛ حیلە؛ لێب؛ لێپ؛ خاپ؛ دەهۆ؛ گەڕ؛ دۆلاب؛ تەون و بەست ٢. دوخمانی؛ ناپاکی؛ بەدفەڕی؛ خایەنی؛ ناڕاستی؛ خەیانەت.

▣ **نارو زدن**: گەڕ فرۆشتن؛ ناپاکی‌کردن؛ گەڕ کردن؛ خاپاندن؛ لاباندن؛ بەدفەڕی‌کردن ‹می‌خواست به دوستش نارو بزند: دەیەویست گەر بە دۆستەکەی بفرۆشی›.

**ناروا** / nāravā/: صفت. نابەجێ؛ ناحەق؛ نابەحەق؛ نەهەق؛ نەهەز؛ گووج؛ نارەوا؛ نادرووس؛ نەبڕێ؛ ئائل؛ ناشایستە؛ نەشاسە؛ بە پێچەوانەی قانوون یان خدەی پەسند. بەرانبەر: **روا** ‹کار ناروا: کاری نابەجێ›.

**نارواني** / nāravānî/: اسم. [شیمی] گرانڕۆیی؛ نارەوانی؛ خەستی؛ خەسی؛ هەسی؛ خۆگرتوویی تراو لە ئاست خوڕ بوون و شلپ‌دانەوە.

**ناروزن** / nārowzan, nāro:- ، ـها/: صفت. [گفتاری] تەپرەش؛ فێڵباز؛ گەڕباز؛ گەڕساز؛

حیلەساز؛ کامباخ؛ کەمباخ؛ دەسبڕ؛ شەشبەندی؛ تەڕن؛ ڕیپۆ؛ خەپۆ؛ بەمبولـە؛ گزیکـەر؛ گزیکـار؛ چـۆغل؛ دەغـەڵ؛ زەغـەڵ؛ لێبـۆک؛ دەغـووڵ؛ دەغوڵ؛ هۆگری فێڵ و فەرەج.

**نـارون** / nārvan ، ـهـا/:اسم. وزم؛ نارەونـد؛ نارەوەن؛ وەزم؛ دارێکی بێبەر بـە قـەدی ڕەش، لکوپۆپی جـوان، چێـوی ڕەق و پتـەو، گـەڵای ددانە ـ ددانەی چڕ و گوڵی نێر و مێیەوە.

**ناز** [1] / nāz/:اسم. ١. نـاز و نـووز؛ نـاز و نیمنـاز؛ مینگە و فینگە؛ ئانوئـون؛ ئـاینوئـوین؛ مـەهن؛ قەژمـەری؛ خـۆگری و ئاوڕنەدانـەوەی درۆینـە ‹اوّل قدری ناز کرد و «نمی‌توانم» و «نمی‌کنم» گفت، اما همین‌که پول را دید راضی شد: سەرەتا بـڕێ نـازی کرد و «ناتوانم» و «نایکەم»ی گوت، بەلام هـەر کـە پارەی بینی نەرم بوو› ٢. ناز؛ تناز؛ هەنگ؛ مـەکر؛ عیشوە؛ کریشمە؛ غەمزە؛ خەمزە؛ چڤ؛ کەشم و نەشم؛ شاخ و بەڵەک؛ خنج؛ خنجکە؛ خۆنـوێنی بۆ ڕاکێشانی سەرنجی دیتران ‹خیلی با نـاز و ادا حرف مـی‌زد و راه مـی‌رفـت: زۆر بـە نـاز و ئـەتوارەوە قسەی دەکرد و بە ڕێدا دەڕۆیشـت› ٣. تنـاز؛ نـاز؛ کار و ڕەوتی خۆ هەڵکێشان؛ خۆ گـرتن؛ نـازین؛ فیزکـردن ٤. [گفتـاری] نـەوازش؛ کـار و ڕەوتی لاواندن؛ لاواندنەوە؛ لاوەنەی؛ پەلاندن ‹دستی بـە سـر بچـه کشید و نـازش کـرد: دەسـتێکی بـە سـەر منداڵـەکەدا کێشـا و نەوازشـی کـرد› ٥. [ادبـی] ئاسوودەیی؛ ئاسایشت ‹ناز و نعمـت: ئاسـوودەیی و فراوانی› ٦. گل ناز ☜ **گل**

▣ **نـاز شسـت**: دەسخۆشـانە؛ دەستخۆشـانە؛ دەسوەشانە؛ پارە یـان مـاڵـێ کـە کەسـێ بـە بۆنەی کارێکی گرینـگ یـا خزمەتێکـەوە کـە کردوویە وەریدەگرێ.

▣ **ناز داشتن**: نازدار بوون؛ نازار بوون؛ عیشوەدار بوون؛ بە ناز بوون؛ بە ئاینوئۆین بوون.

**نـاز کـردن**: ١. نـازکردن؛ بـە درۆ لـووت چەرخانـدن ٢. عیشـوە و خـەمزەکردن؛ نـاز فرۆشتن؛ خەمزە و ناز کردن؛ هەنگ‌کرن؛ نـاز و نیمنـازکردن؛ ئـاینوئـۆینکـردن؛ ئینجـە و فینجەکردن؛ خۆشـاندان بـە نـاز و خـەمزەوە ٣. نەوازشت‌کردن؛ لاواندنەوە؛ ئەوەلاونەی.

ناز کسـی خریـدار داشـتن ☜ **نـاز کسـی را خریدن/ کشیدن**

**ناز کسی را خریدن/ کشیدن**: نـازی کەسـێک کێشان؛ دڵنەواییکردن لە کەسێک؛ خەمخۆر و دڵسۆزی کەسێک بوون؛ ئاکار و کرداری بـە ناز و نیمنازی کەسـێ هەڵـگرتن: **نـاز کسـی خریدار داشتن**

**ناز** [2]: صفت. [گفتاری] نازدار؛ نـازار؛ بـەناز؛ نـازەنین ‹بچه خیلی ناز بود: مناڵەکە زۆر نازار بوو›.

**نازا** / nāzā ، ـهـا/: صفت. نـەزۆک؛ نـەزا؛ نـەزێ؛ مەزا؛ زکنەکەر؛ خەش؛ بەیچەڵ؛ بەچەڵ؛ بێوار؛ هـەرکان؛ مایـێ؛ قـرد؛ خـرش؛ بـێتوانسـت و لێهاتوویی باردار بوون.

▣ **نـازای فصـلی**: قسـر؛ ئەسـتێور؛ ئەسـتەویر؛ ستەور؛ ستۆر؛ کوندۆ؛ ئاژەڵی مێ کە سالـێک سکی پڕ نەبووە.

**نازائی** / nāzā'î/ ☜ **نازایی**

**نازایی** / nāzāyî ، ـهـا/:اسم. نـەزۆکی؛ نـەزایی؛ ئەستێوری؛ خرشی: **نازائی**

**نازبـالش** / nāzbāleš ، ـهـا/:اسم. نازبالـنج؛ گۆشـەگیرە؛ گۆشـگیرە؛ باڵەشـتە؛ باڵـنجەک؛ باڵنجی سووک و بچووک.

**نـازپرورده** / nāzparvarde ، ـهـا؛ ـگـان/: صفت. نازپـەروەردە؛ بـەناز بـەخێوکراو؛ بارهـاتوو لـە ئاسوودەحاڵی و ئاسایش، وێـڕای چاوەدێری و میرەوانی، بێچەرمەسەری دیتن.

**نازک** / nāzok/: صفت. ناسـک؛ نـازک؛ نـازگ: ١. نـارین؛ تـەنک؛ تنـک؛ فـڕ؛ تیـوون؛ واڵ؛ بـە مەودای کەم لە نێوان بەر و پشتدا ‹کاغذ نـازک: کاغـەزی ناسـک› ٢. [گفتـاری] باریـک؛ زراڤ؛ کەمئەستوور؛ واوەژێلک؛ بە ئەستوورایی هنـدک

‹انگشت نازک: ئەنگوستی ناسک› ۳. *[مجازی]* نەرم و نیان ‹صدای نازک: دەنگی ناسک›.

**نازک‌اندام** / nāzok'andām، ـها/: *صفت.* نازکەک؛ هنف؛ لەش‌ناسک؛ ناسکەنام. هەروەها: **نازک‌بدن**

**نازک‌بین** / nāzokbîn، ـها؛ ـان/: *صفت. [مجازی]* وردبین؛ خاوەن سەرنج و ژیهاتی بۆ دیتن و دۆزینەوەی وردەکاریگەل.

**نازک‌خیال** / nāzokxiyāl، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ناسک‌خەیاڵ؛ خاوەن بیر و ئەندیشەی ورد و جوان. هەروەها: **نازک‌خیالی**

**نازک‌دل** / nāzokdel، ـان/: *صفت. [مجازی، ادبی]* دڵ‌ناسک؛ کەم‌تاقەت لە بەرامبەر دەرد و ئازار و خەمەوە.

**نازکش** / nāzkeš/: *اسم.* نازکێش؛ نازکەش؛ کەسێ کە نازی یەکێکی‌تر دەکێشێ ‹می‌بیند نازکش دارد، ناز می‌کند: ئەزانێ نازکێشی هەیە ناز دەکا›.

**نازک‌کاری** / nāzok.kārî/: *اسم.* ۱. *[ساختمان]* ناسک‌کاری؛ قۆناغێ لە ڕەوتی چالاکی ماڵ‌کردنەوەدا، بریتی لە سپی‌کاری، کاشی‌کاری، هەڵواسینی دەرگا و دەلاقە و... بەرانبەر: **سفت‌کاری** ۲. *[مجازی]* وردەکاری؛ نەستەق‌بێژی ‹در این مقاله باید از آن‌همه نازک‌کاری صرف‌نظر کنیم: لەم وتارەدا دەبێ لەو هەموو وردەکاریانە واز بێنین› ۳. نازک‌کاری؛ کاری دروست‌کردنی ئامرازی جۆراوجۆر (وەک تەختەنەرد، قەڵەمدان، مێزشەترەنج و...) بە جوانکاری لە سەر چێو بەتایبەت دارگوێز.

**نازک‌نارنجی** / nāzoknārencî، ـها/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* تەسکۆڵە؛ تەسکۆلانە؛ نازنازی؛ نازپەروردە؛ ناسک‌نارنجی؛ بەبێ خۆڕاگری و بەرگەی پێویست لە بەرانبەر سەختی و دژواریەوە ‹این جوان‌های نازک‌نارنجی: ئەم لاوە تەسکولانە›.

**نازک‌نی** / nāzokney/: *اسم.* دروشێ؛ دروشە؛ قاپی باریک؛ ئێسکە ناسکەی لوولاک.

**نازکی** / nāzokî/: *اسم.* ناسکی؛ نازکی؛ باریکی؛ زراڤی ‹لبش از نازکی بار تبسم بر نمی‌دارد: لێوانی لە بەر ناسکی پێکەنینیان لێ گرانە›.

**نازل** / nāzel/: [عربی] *صفت.* ۱. هەرزان؛ کەم؛ هندک ‹بهای نازل: نرخی هەرزان› ۲. نزم؛ نەوی؛ نقی؛ نەڤی؛ ڤێل؛ نمز؛ نەوەر ‹سطح نازل: ڕووبەری نزم›.

▣ نازل شدن: هاتنە خوار/ خوارەوە؛ ئامایرە وار؛ وار ئامەیش؛ لە ئاسمانەوە هاتن.

**نازنازی** / nāznāzî/: *صفت. [گفتاری]* ۱. نازار؛ نازدار؛ نازەنین ‹بچه‌های نازنازی: منالگەلی نازار› ۲. /ـها/ ناسک‌نارنجی؛ نازنازی؛ تەسکۆڵە؛ نازپەروەردە.

**نازنین** / nāzanîn/: *صفت.* نازەنین؛ نازلی؛ نازار؛ نازدار: ۱. زۆر خۆشەویست ‹مرد نازنینی بود: پیاوێکی زور خوشەویست بوو› ۲. *[مجازی]* بەنرخ؛ هێژا؛ پڕبایەخ ‹اوقات نازنینت را تلف نکن!: کات و ساتی بەنرخت بە فیڕۆ مەدە!› ۳. جوان؛ دەلال؛ زەریف ‹نسیمی صورت نازنینش را نوازش می‌داد: شنەیەک ڕوخساری ناسکی دەلاواند› ٤. *[قدیمی]* نازار؛ بەناز؛ نازێ ٥. *[مجازی، قدیمی]* دڵبەر؛ دلبەر؛ گراوی.

**ناز و نعمت**/ nāz-o-ne'mat/: [فارسی/ عربی] *اسم.* ناز و نیعمەت؛ ئاسایشت و دەوڵەمەندی؛ ئاسوودەیی و دارایی.

**ناز و نوازش** / nāz-o-navāzeš، ـها/: *اسم.* دلنوایی؛ دلنەوایی.

**ناز و نوز** / nāz-o-nûz، ـها/: *اسم. [گفتاری]* ئین و ئوون؛ ئاین و ئۆین؛ ناز و نووز؛ تناز؛ ئینجە و فینجە؛ ناز و نیمناز؛ ناز و نیوناز؛ قسە و ئاکاری بە نیشانەی دژی یا قبووڵ‌نەکردنی درۆینە ‹اوّل قدری ناز و نوز کرد، بعد پول را گرفت: سەرەتا هێندێک ئین و ئوونی کرد، ئیمجا پارەکەی وەرگرت›.

**نازی** / nāzî/: *صفت.* ۱. */گفتاری/* نازیْ؛ نازلی؛ نازنازی؛ نازەنین؛ دەلال ۲. [فرانسوی] نازی؛ سەر بە نازیسم ۳. [فرانسوی] ـها/ نازیست.

**نازیدن** / nāzîdan/: *مصدر. لازم.* // **نازیدی**: نازیت؛ **می نازی**: دەنازی؛ **بناز**: بنازە// نازین؛ نازەی: ۱. فیز/ فیس کردن؛ خۆ هەڵکێشان؛ خۆ نواندن؛ فشین ‹به ثروت خود نازیدن: بە پووڵ و پارەی خۆ نازین› ۲. شانازی کردن ‹کردستان باید بە فرزندان خود بنازد: کوردستان دەبێ بە ڕۆڵەکانیەوە شانازی بکا›. هەروەها: **نازیدنی**

■ مصدر منفی: **ننازیدن** (نەنازین)

**نازیست** / nāzîst، ـها/: [فرانسوی] *صفت.* نازی؛ نازیست؛ لایەنگر و هەواداری نازیسم.

**نازیسم** / nāzîsm/: [فرانسوی] */اسم. [سیاست]/* نازیسم؛ ئامۆژەیێکی ڕامیاری و کۆمەلایەتی کە لە سیەکانی چەرخی بیستەم لە ئەلماندا پێک‌هات و لە سەر بنەمای پاوانخوازی تاقەحیزبی، ڕەگەزپەرستی لەڕادەبەدەر و زۆرەملی و دەسەلاتخوازی بنیات نرابوو: **ناسیونال سوسیالیسم؛ سوسیالیسم ملی**

**ناس** / nās/: [؟] */اسم.* ناس؛ ماکێکی سڕکەرە لە ئاهەک و تەماکۆ، دەیکەنە ژێری زمان و ئاوەکەی تف دەکەنەوە: **نسوار**

**ناساز** / nāsāz، ـها/: *صفت. [ادبی]* نەساز؛ ناساز: ۱. نارێک؛ ناجۆر؛ ناکۆک؛ ناتەکووز ۲. شێواو؛ ئاڵۆز؛ پەرێشان ۳. ناتەبا؛ ناخۆش.

**ناسازگار** / nāsāzegār/: *صفت.* ناکۆک؛ ناسازگار: ۱. ناتەبا؛ ناحاواو؛ تایبەتمەندی ئەوەی کە لە سازان و تەبایی دڕدۆنگە ۲. نەخۆش؛ نەخوەش؛ نەوەش؛ لە لەش بیمار.

**ناسازگاری** / nāsāzegārî، ـها/: *اسم.* ناتەبایی؛ ناسازگاری: ۱. ناکۆکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی ناتەبا بوون ‹ناسازگاری رنگ‌ها: ناتەبایی ڕەنگەل› ۲. ناحاواوی؛ دۆخی تەیار نەبوون بۆ ئاریکاری، هاودەمی یان هاوژینی دەگەل کەسێکدا ‹شوهرش ناسازگاری می‌کرد و بهانه می‌گرفت: مێردەکەی ناتەبایی دەکرد و پەڵپی دەگرت›. هەروەها: **ناسازگار**

**ناسپاس** / nāsepās/: *صفت.* سپلە؛ ناسپاس؛ پێ‌نەزان؛ دەلۆش؛ ناشکور؛ ناشگیر؛ نمەک‌کوێر؛ نمەک‌نەناس؛ بێ‌سفەت؛ بێ‌بەقا ‹فرزند ناسپاس، پدر پیرش را بی‌پناه گذاشت و رفت: مندالی سپلە، باوکی پیری بێ‌پەنا بەجێ‌هێشت و لێیدا ڕۆیی›.

**ناسپاسی** / nāsepāsî/: */اسم.* سپلەیی؛ ناسپاسی؛ پێ‌نەزانی؛ دەلۆشی؛ بێ‌ئەمەگی؛ نمەک‌کوێری؛ بێ‌سفەتی؛ نمەک‌نەناسی؛ بێ‌بەقایی؛ چۆنیەتی لەبەرچاو نەبوونی چاکەی خەلک.

**ناسخ** / nāsex/: [عربی] */اسم.* ۱. هەلوەشێنەر؛ هەلوەشێن؛ بەتاڵەوکەر ‹این ناسخ قانون قبلی است: ئەمە هەلوەشێنەری قانوونی پێشووە› ۲. ـین؛ نُسّاخ/ ڕوونووس؛ فەرکێنەر ‹این اشتباه ناسخ، معنی جمله را عوض کرده است: ئەم هەلەی ڕوونووسە، واتای ڕستەکەی گۆڕاوە›.

**ناسره** / nāsare/: *صفت. [ادبی]* زەغەل؛ بەدەل؛ ناعەسل؛ قەلب؛ قەلپ.

**ناسزا** / nāsezā، ـها/: */اسم. [ادبی]* چۆڕس؛ جنێو؛ جوێن؛ سخێف؛ دژون؛ دژمانی؛ دژوێن؛ خوسن؛ خەبەر؛ ڕەف؛ سکان؛ ڤێسین؛ ناوە؛ قسەی لە سەر دل گران.

▣ ناسزا گفتن: سکانن؛ ڤیلین؛ جنێو دان؛ دژوێن دان؛ دژمان دەی.

**ناسلامتی** / nāsalāmatî/: [فارسی/ عربی] *حرف.* */گفتاری/* بە ناخێر؛ ناسلامەتی؛ بە زیادنەبێ؛ خودابیبڕێ؛ خوابیوڕێ؛ وشەی بەرهەلستی بە ڕووداو یان دۆخێک، بە واتا «بریا وا نەبووبا» ‹ناسلامتی می‌خواستم یک ساعتی استراحت کنم: بەناخێر ئەمەویست تاوێ بحەسێمەوە›.

**ناسوت** / nāsût/: [معرب از آرامی] */اسم. [ادبی]* دونیا؛ دنێ؛ دنیا؛ ناسووت؛ جیهانی مادی.

**ناسوتی** / nāsûtî/: [معرب] *صفت. [ادبی]* ناسووتی؛

دنیایی؛ دونیایی؛ پێوەندیدار یا سەر بە جەهان.

**ناسور** / nāsûr/: [عربی]/اسم. ناسۆر؛ ناسوور: ١. [پزشکی] ئاخووت؛ فیستول؛ گەیشتنەوەیەکی ناسروشتی و نالەباری دوو هلۆلی ناوەکی لەش یان دەم کردنەوەی شوێنێکی وا لە لەشدا ٢. برین؛ زام.

**ناسیونال سوسیالیسم** / nās(i)yonālsosyālîsm/: [فرانسوی] ☜ **نازیسم**

**ناسیونالیست** / nās(i)yonālîst/: [فرانسوی] صفت. نەتەوەخواز؛ نەتەوەگر ‹من یک ناسیونالیست معتقد و طرفدار حقیقت هستم: من نەتەوەخوازێکی بە باوەڕ و لایەنگری ڕاستیم›.

**ناسیونالیستی** / nās(i)yonālîstî/: [فرانسوی] صفت. نەتەوەخوازانە؛ نەتەوەگرانە ‹بعضی از احزاب اندیشه‌های ناسیونالیستی دارند: هەندێ لە پارتەکان، بیری نەتەوەخوازانەیان هەیە›.

**ناسیونالیسم** / nās(i)yonālîsm/: [فرانسوی]/اسم. نەتەوایەتی؛ نەتەوەخوازی؛ نەتەوەگری؛ ڕێبازی هۆگری و بڕوامەندی لەڕادەبەدەر بە هۆز و نەتەوەی خۆ.

**ناشایست** / nāšāyest/: صفت. نەشیاو؛ ناشایی؛ ناشایس؛ ناشایست؛ هەلهەلە؛ خراپ؛ ناسزا؛ نەژهەژی؛ نەژیهاتی؛ ئائل؛ ناتەبا دەگەڵ بایەخگەلی ئاکاریدا ‹سخن ناشایست: پەیڤی نەشیاو›.

**ناشتا**[1] / nāštā/: [فارسی/ هندی] صفت. هەناشتا؛ تاشت؛ ناشتە؛ ئاناشتا؛ ناشتا؛ لەخرێن؛ لەخرێنی؛ لەخورێن؛ خرێن؛ خورێن؛ لەرخین؛ لەرخێنی؛ لەخورێنی؛ هێشتا هیچ نەخواردووی پاش لە خەو هەستان ‹دیروز تا نزدیک ظهر ناشتا بودم: دوێنێ تا لای نیوەڕۆ هەناشتا بووم›.

**ناشتا**[2]: قید. دڵخالی؛ بە دڵی خالی؛ بە دڵ خالی؛ ناشتا؛ لەرخین؛ لەرخێنی؛ لەخورێنی؛ زیرقەلو؛ بەبێ خواردنی قاوەتی ‹فردا صبح ناشتا بیا برای آزمایش: سبەی بەیانی دڵخالی وەرە بۆ ئەزمایش›.

**ناشتائی** / nāštā'î/: [فارسی/ هندی] ☜ **ناشتایی**

**ناشتایی** / nāštāyî، ـها/: [فارسی/ هندی]/اسم. ناشتایی؛ هەناشتایی؛ سوبحانە؛ سوحانە؛ سحانە؛ بەردڵ؛ بەرتێشت؛ بەرچا؛ بەرقلیان؛ ژێرقلیان؛ نانی سەر لە بەیان: **ناشتائی**

**ناشر**[1] / nāšer، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی]/اسم. پەخشانگا؛ بلاوگە؛ دەزگا و دامەزراوەی لە چاپ دان و بلاوکردنەوەی کتێب ‹ناشر همکاری نمی‌کند: پەخشانگا هاوریێی ناکا›.

**ناشر**[2]: صفت. بلاوکەرەوە؛ پەخشانگا؛ بەلاڤکەر ‹ناشر این فرهنگ دانشگاه کردستان است: بلاوکەرەوەی ئەم فەرهەنگە زانستگای کوردستانە›.

**ناشزه** / nāšeze/: [عربی]/اسم. [حقوق] ناشیزە: ١. ژنێ کە لە فەرمانی شووی سەرپێچی دەکا ٢. ژنێ کە شووەکەی بەبێ تەلاقدانی بەجێی هێشتووە.

**ناشکری** / nāšokrî/: [فارسی/ عربی]/اسم. بێ‌ئەمەگی؛ پێ‌نەزانی؛ ناشوکری؛ ناشکوری؛ سپلەیی؛ کار یا ڕەوتی دەربڕینی ناڕەوایی یان بەرتەکی ناهەق بەتایبەت سەبارەت بە بار و دۆخی خۆ ‹ناشکری نکن این زندگی از سرت هم زیاد است: بی‌ئەمەگی مەکە ئەم ژیانەت لێ‌زیادە›.

**ناشکوفا** / nāšokûfā, nāšekûfā/: اسم. [گیاه‌شناسی] نەپشکووتوو؛ جۆرێ میوە کە دوای گەیین دەم ناکاتەوە و دەنکەکەی لە ناو میوەکەیدا دەمێنێتەوە (وەک گوێز).

**ناشناخته**[1] / nāšenāxte، ـها/: صفت. نەناسیاو؛ نەناسراو؛ نەشناسیاگ؛ نەژناسیا؛ نەشناسیا: ١. نەناس؛ نەشناس ‹سرزمین‌های ناشناخته: ولاتانی نەناسراو› ٢. دوور لە زانستی مرۆ ‹جهان‌های ناشناخته: دنیاگەلی نەناسراو›.

**ناشناخته**[2]: قید. نەناسراو؛ نەناسیاگ؛ گوم؛ نەدیار؛ بە نەناسیاویەوە؛ بە نەناسیاگی ‹ناشناخته وارد انجمن شد: نەناسراو چووە ناو کۆڕەکەوە›.

**ناشناس** / nāšenās/: *صفت.* نەناس؛ نەنیاس؛ نەشناس؛ غەوارە؛ غەریبە؛ گەچە؛ گەجە؛ نائاشنا؛ نەناسیاو؛ بێگانە؛ لاپۆرە؛ لاپرە؛ لاپرەسەن؛ لاپرەسەنگ؛ کەدە؛ کەجە؛ بیانی؛ ناس‌نەکری؛ لاوەکی. بەرانبەر: **آشنا** ‹مرد ناشناس: پیاوی نەناس›.

**ناشنوا**[1] / nāšenavā ، ـها؛ ـیان/: *اسم.* کەڕ؛ کاس؛ کرووس؛ نەژنەوا؛ نەژنەو؛ نەبهیست؛ نەبیس؛ گوێ‌کپ؛ کهەڕ؛ کهەڕۆ؛ کڕیڵ؛ گوێ‌نەبیس؛ کەسێ کە بە هۆی گەزنێکەوە یان زگماک دەنگ نابیسێ.

**ناشنوا**[2]: *صفت.* کەڕ؛ کهەڕ؛ کهەڕۆ؛ کاس؛ کڕیڵ؛ نەبهیست؛ نەبیس؛ گوێ‌کپ.

**ناشنوائی** / nāšenavā'î/ ☜ **ناشنوایی**

**ناشنوایی** / nāšenavāyî/: *اسم.* نەژنەوایی؛ کەڕی؛ گوێ‌نەبیسی: ١. دۆخ یا چۆنیەتی کەڕ بوون ٢. کەمایەسی لەشی کە دەبێتە هۆی لە کارکەوتنی هەستی ژنەوایی * **ناشنوائی**

**ناشور** / nāšûr/: *صفت. [گفتاری]* نەشۆراو؛ نەشۆردراو؛ نەشۆریاگ؛ ئەوەنەشۆریا ‹صورت ناشور: دەم و چاوی نەشۆراو›.

**ناشی** / nāšî/: [عربی] *صفت.* ١. ناشی؛ نیهانی؛ خەشیم؛ کارنەزان؛ نوهانی؛ گەندەکار؛ گەنەکار؛ قەوچل؛ کۆڵی؛ ڕانەهاتوو لە کار ‹ مترجم ناشی: وەرگێری ناشی› ٢. سەرچاوکە/ سەرچاوەگرتوو ‹بیشتر بیماری‌ها از پرخوری ناشی می‌شود: زۆربەی نەخۆشیەکان سەرچاوەگرتوو لە زۆرخواردنن›.

هەروەها: **ناشی بودن؛ ناشی شدن**

**ناشیانه**[1] / nāšiyāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* خەشیمانە؛ تازەکارانە؛ کەمزانانە؛ نوهانیانە؛ قەوچلانە؛ کۆڵیانە؛ ناشیانە ‹رفتار ناشیانه: ئاکاری خەشیمانە›.

**ناشیانه**[2]: *قید.* خەشیمانە؛ ناشیانە؛ تازەکارانە؛ کەمزانانە ‹ناشیانه کار می‌کرد: خەشیمانە کاری دەکرد›.

**ناشیگری** / nāšîgarî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ناشیگەری؛ نیاوەزیان؛ کارنەزانی؛ تازەکاری؛ خامی ‹ناشیگری کرد و کار خراب شد: ناشیگەری کرد و کارەکە تێکچوو›.

**ناصح** / nāseh ، ـان؛ ـین/: [عربی] *صفت. [ادبی]* ئامۆچیار؛ ئامۆژگار؛ ئامۆژیار؛ ئامۆژگاری‌کار.

**ناصیه** / nāsiye ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* توێڵ؛ تەوێڵ؛ هەنی؛ هەنیە؛ ئەنی؛ نەهتک؛ جەمین؛ ناوچاوان.

**ناطق**[1] / nāteq ، ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* بێژەر؛ وتاربێژ؛ وتەبێژ؛ ئاخێوەر؛ قسەکەر؛ ئەوەی بۆ خەڵکی قسە دەکا ‹ناطق دربارەی وضع دانشگاەها سخن گفت: بێژەر لەمەڕ بار و دۆخی زانستگاکانەوە قسەی کرد›.

**ناطق**[2]: *صفت. [ادبی]* قسەکەر؛ وتەبێژ؛ ئاخێوەر؛ بێژەر؛ بە توانستی ئاخاوتن ‹حیوان ناطق: حەیوانی قسەکەر›.

**ناظر**[1] / nāzer ، ـها؛ ـان؛ ـین؛ نُظّار/: [عربی] *اسم.* چاوەدێر؛ چاودێر؛ چاویار؛ چاڤدێر؛ کەتوان؛ کەسێ کە دەبێ ئاگاداری دروست بەڕێوەچوونی کارێک بێت، بێ‌ئەوەی خۆی کار بکا.

**ناظر**[2]: *صفت.* بینەر؛ تەماشاکەر؛ تواشاکەر، بەتایبەت دۆخی چاو لە ڕووداوێک بوون و هیچ دەورێکی تێدا نەبوون ‹او فقط ناظر دعوا بود: ئەو هەر بینەری شەڕەکە بوو›.

**ناظم** / nāzem ، ـها؛ ـان؛ ـین/: [عربی] *اسم.* نازم؛ کەسێ کە چاوەدێری بەڕێوە چوونی داب و ڕاگرتنی تەکووزی و ڕێکوپێکی لە دامەزراوەیەکی (بەتایبەت قوتابخانە یان نەخۆشخانە) پێ‌سپێراوە.

**ناظمه** / nāzeme ، ـها/: [عربی] *اسم.* نازمی ژن.

**ناعلاجی** / nā'alācî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* ناچاری؛ نەچاری: ١. مەجبووری؛ بێ‌دەرەتانی؛ چارەنەماوی؛ ناعیلاجی ٢. بێ‌دەرمانی؛ بێ‌دەرمۆیی؛ چارنەهاتوویی؛ چارنەکراوی.

هەروەها: **ناعلاج**

**ناعمویی** / nā'amûyî/: [فارسی/ عربی/ فارسی] *اسم.* زڕئاپ؛ زڕمام؛ زڕبرای باوک.

**ناعور** / nā'ûr/: [عربی] *اسم.* جەڕجەڕە؛ جەنجەڕ؛ گەردوون؛ چەرت؛ چەرخێ کە دۆلاو یان سەتڵێکی پێوەیە بۆ هەڵهێنجانی ئاو لە بیر.

**ناغافل** [1] / nāqāfel/: [فارسی/ عربی] *صفت. [گفتاری]* نەکاو؛ ناکاو؛ لە ناکاو؛ گوزوگومەت؛ ناخافڵ؛ یەکهۆ؛ یەکهەو ‹انفجار ناغافل: تەقینەوەی نەکاو›.

**ناغافل** [2]: *قید. [گفتاری]* ناکاو؛ لە نکاو؛ لە نەکاو؛ لەپڕ؛ لەپڕا؛ لەپڕدا؛ لە پڕایەکی؛ لە پڕێ؛ لە بڕڕا؛ ناگا؛ ناخافڵ؛ یەکهۆ؛ گزوگومەت؛ نش ‹ناغافل ریختند سرش و او را لخت کردند: ناکاو هاشاولیان بۆ برد و ڕووتیان کردەوە›.

**ناف** / nāf/: *اسم.* ١. ناوک؛ ناوکە؛ نێوک؛ ناڤ؛ ناڤک؛ نافک؛ نیڤک؛ ناکە؛ ناک؛ گرتک؛ نەهە؛ شوێنی بڕیانی بەندی ناوک کە بە شێوەی قوولاییێکی بچووکی لێوار زەق لە ناوەڕاستی زگدا ماوەتەوە ٢. *[گیاەشناسی]* ناوک؛ ناوکە؛ شوێنی پێوەلکانی دەنک بە بەندی تۆمەوە کە وەک چاڵۆکەیێ لە سەر تۆکڵی دانەوە دیارە ‹ناف دانەی لوبیا: ناوکی دەنکە لووبیا› ٣. نێوەڕاست؛ ناوەڕاس؛ چەق؛ دوڕ؛ نێوان ‹ناف آسمان: نیوەڕاستی ئاسمان›.

▣ **ناف افتادن**: ناوککەوتن؛ نەهەکەوتەی؛ جێبەجێ بوونی ماسوولکەکانی سەر ناوک بە هۆی هەڵگرتنی شتی قورسەوە.

**ناف بریدن**: ناوک بڕین؛ ناف بڕین؛ نەهە بڕیەی؛ بڕین و لابردنی ناوکی منداڵ لە کاتی هاتنە دنیادا.

**ناف کسی را با چیزی بریدن**: *[کنایی]* فرچکی کەسێک بە شتێک بەستن؛ یەکجار هۆگری شتێک بوون ‹انگار ناف او را با دروغ بریدەاند: ئەڵێی فرچکیان بە درۆ بەستووە›.

**ناف کسی را برای کسی بریدن**: ناوی کەسێک بۆ بردن؛ ناو کەسێ نانە سەر کەسێکەوە؛ نیشانکردنی کچێک لە کاتی هاتنە دنیادا بۆ کوڕێک ‹ناف او را برای پسرعمویش بریدەاند: ناوی کوڕەمامیان بۆ بردووە›.

**ناف کسی را چرب کردن**: *[کنایی]* سمێڵی کەسێک چەورکردن؛ بە کردنی کارێک کەسێ ڕازیکردن ‹سعی میکرد در فرصت مناسبی ناف او را چرب کند: دەیکۆشا لە دەرفەتێکی شیاودا سمێلی چەور بکا›.

**به ناف کسی بستن**: *[کنایی]* بە سەر کەسێکدا بڕین؛ کردنە مل کەسێ؛ کردنە ڕیش کەسێکەوە؛ بە سەر کەسێکدا سەپاندن.

**نافذ** / nāfez/: [عربی] *صفت.* ١. کارکۆ؛ کارتێکەر؛ خاوەن کارایی ٢. بەبڕشت؛ جێ پشت بەستن ‹این قانون هنوز نافذ است: ئەم قانوونە هێشتا بەبرشتە›.

**نافرجام** / nāfarcām/: *صفت.* بێئاکام؛ پووچەڵ ‹تلاش نافرجام: تەقالای بێئاکام›.

**نافرمان** / nāfarmān ، ـها؛ ـان/: *صفت.* نافەرمان؛ سەرپێچیکەر؛ سەرپێچکار؛ سەرشەق؛ سەربەزێو؛ سەرکێش؛ سەرکەش ‹مامور نافرمان تنبیه شد: فەرمانبەری نافەرمان تەمێ کرا›.

**نافرمانی** / nāfarmānî ، ـها/: *اسم.* سەرپێچی؛ سەرکێشی؛ سەرکەشی؛ نافەرمانی؛ سەربزێوی؛ سەرچەوتی؛ کاری لادان لە فەرمان ‹اگر نافرمانی کنید، مجازات خواهید شد: بێتوو سەرپێچی بکەن، تەمێ دەکرێن›.

**نافع** / nāfe'/: [عربی] *صفت. [ادبی]* بەکەڵک؛ کەڵکدەر؛ سووددەر؛ قازانجدەر؛ سوودبەخش ‹عمل نافع: کردەوەی بەکەڵک›.

**نافلز** / nāfelez(z) ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* ناکانزا؛ ناویرە؛ توخمی کیمیایی (وەک کەربون، نیترۆژن) کە تایبەتمەندیگەلی باوی کانزای نیە: **غیرفلز**

**نافه** / nāfe/: *اسم.* ١. *[گیاەشناسی]* سەرجەمی

پەرچەمگەلی گـوڵ لـە گیـای تۆمـداردا ٢. بـز؛ کیسەیەکی چکۆلەیە لە پەنا ناوکی ئاسکی نێردا کە ماکی بۆنخۆشی میسکی تێدایە.

**ناقابل** / nāqābel/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بێبایەخ؛ کەمبایەخ؛ بێئـەرزش؛ بـێقـەدر ‹کمک ناقابل: یارمەتی بێبایەخ›: **بیقابلیت**

**ناقد** / nāqed ، ـان؛ ـین/: [عربـی]/*اسم.* ڕەخنـەگر؛ کەسێ کە کاری ڕەخنەگرتنە.

**ناقص** / nāqes ، ـهـا/: [عربـی] *صفت.* ١. ناتـەواو؛ نیوەکارە؛ ناتواو؛ کەلوکوتەر؛ یەوکشت؛ نیمچـە؛ نیوەچڵ؛ نیمەچڵ؛ قومەرو؛ کەموکووڕ ‹کار هنوز ناقص است: هێشتا کارەکە ناتـەواوە› ٢. سـەکەت؛ سەقەت؛ کەم ئەندام ‹از یک پا ناقص است: پایەکی سەکەتە›.

▣ **ناقص شدن**: سـەکەت/ کـوڵ بـوون؛ کـەل و کوتەر بوون؛ ئەیقدار بوون؛ ئەنـدامێکی لـەش لە دەست دان. هەروەها: **ناقص کردن**

**نـاقص‌الخلقـه** / nāqesolxelqe ، ـهـا/: [عربـی] *صفت.* شەهەت؛ ناتەواوی زگماک.

**نـاقص‌العضـو** / nāqesol'ozv ، ـها؛ ـان/: [عربـی] *صفت.* نیمجەت؛ نقوستان؛ نوقوسـتان؛ نوخسـان؛ نوقسان؛ سەکەت؛ سەقەت؛ هلۆت؛ تایبەتمەندی گیاندارێ کە ئەندامێکی نیە یان ناتەواوە.

**نـاقص‌عقـل** / nāqes'aql ، ـهـا/: [عربـی] *صفت.* کەمئاوەز؛ عەقڵسووک ‹آدم ناقص‌عقل خـودش را می‌دهد بـە دسـت دیگـری: مـرۆی کـەمئـاوەز خـۆی دەسپێرێتە کەسێکی دیکە›.

**ناقض** / nāqez ، ـها؛ ـین/: [عربی] *صفت.* تێکـدەر؛ تیابەر؛ تێدابەر ‹این عمـل نـاقض آزادی اسـت: ئـەم کردەوەیە تێکدەری ئازادیە›.

**ناقـل** / nāqel ، ـهـا؛ ـان؛ ـیـن/: [عربـی] *صـفت.* ڕاگوێزەر؛ ‹آب آلوده ناقل بیماری اسـت: ئـاوی پـیس ڕاگوێزەری نەخۆشیە›.

**ناقلا** / nāqolā ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* ١. زیتـەڵ؛ زیتەڵە؛ زیرەک؛ زرینگ؛ زرنگ؛ زرک؛ مەزلووت؛ زرت و زینگ؛ زیت ‹جوان ناقلایی است: گەنجێکی زیتەڵە› ٢. فێڵباز؛ فێڵەواز؛ زۆڵ؛ گزیکار؛ داوباز؛ گزیکەر؛ حیلەساز ‹روباه ناقلا خودش را به مردن زد: ڕێویە فێڵبازە خۆی لە تۆپێوی داوە›.

**نـاقوس** / nāqûs ، ـهـا/: [معـرب از آرامـی]/*اسم.* گەڕناڵ؛ چام؛ ژام؛ ژان؛ زەنگی کلیسا.

**ـ نـاک** / nāk/: *پسوند.* ـ نـاک: ١. ـ هێنـەر؛ بەدیهێنەر ‹ترسناک: ترسـناک› ٢. بەـ ؛ خـاوەن ‹غمناک؛ سوزناک: خەمناک؛ بەسۆز›.

**ناکـار** / nākār/: *صـفت. [گفتـاری]* شـەلوپـەت؛ شـەلوپـەل؛ لـەتوکـوت؛ زۆر گـەزنگاز و لەکارکەوتە (پتر سەبـارەت بـە گیانـدار) ‹می‌زنم ناکارت می‌کنم: لێت دەدەم شەلوپەتت دەکەم›.

▣ **ناکـار شـدن**: لـە کارکـەوتن؛ پـەککـەوتن/ کەفتن؛ شەلوپەت بـوون؛ شـەلوپـەل بـوون ‹بعد از آن اتفاق ناکار شدم و هفت ماه توی رختخواب افتادم: پاش ئەو کارەساتە لە کار کەوتم و حـەوت مانگان لە جێگەدا بووم›. هەروەها: **ناکار کردن**

**ناکـام** / nākām/: *صـفت.* نـەوەکام؛ نەبـەکام؛ نابەکام؛ نامراد؛ نامرای؛ بێمـراد؛ ناکـام؛ بـەمراد نەگەیشتوو ‹جوان ناکام: لاوی نەوەکام›.

▣ **ناکام مردن**: نـامراد/ بـێمـراد مـردن؛ ناکـام مردن؛ نابەکام مردن؛ بەر لـە چێـژ گـرتن لـە ژیان، مردن ‹پسر بیچاره ناکام مرد: کـوڕی دامـاو نامراد مرد›. هەروەها: **ناکام شدن**

**ناکامی** / nākāmî ، ـها/: *اسم.* نـامرادی؛ ناکـامی؛ نابەکامی؛ نەبەکامی؛ نـەوەکامی؛ بـێبەشـی لـە خۆشی و کامەرانی ژیان.

**نـاک‌اوت** / nāk'owt, nāko:t/: [انگلیسـی]/*اسم.* ناکئەوت؛ تەختی زەوی، بەتایبەت لە مشتێندا.

▣ **ناک‌اوت شـدن**: نـاکئـەوت بـوون؛ تـەختی زەوی بوون و دۆڕاندن.

**ناکجاآباد** / nākocā.ābād/ ☜ **آرمانشهر**

**ناکس** / nākas, nākes ، ـها؛ ـان/: *صفت.* ناکەس: ١. نیمچەکەس؛ کەسێکی نەوەها گرینگ ‹کس

و ناکس حرف آن‌ها را می‌زنند: کەس و ناکەس قسەی ئەوان دەکەن› ٢. بەدفەڕ؛ نـاجنس ‹یـک ناکسـی است که همتا ندارد: بەدفەڕێکە وێنەی نەبێتەوە›.

**ناگاه / nāgāh/:** *قید.* لەپڕا؛ لەپڕ؛ لەپـڕتا؛ لەپـڕێ؛ ناکاو؛ لەنکاو؛ ناکا؛ ناگا؛ ناقا؛ لووت و بزووت؛ لەپڕ و نەکاو؛ گوز و گومەت؛ کت‌وپڕ؛ ببێدەنگی‌ڤـە؛ نشکێڤە؛ ژنشکەکیڤە ‹ناگاه صدایی بلنـد شـد: لەپـڕا دەنگێک بەرزەوەبوو›.

**نـاگزیر [1] / nāgozîr/:** *صـفت.* ناچـار؛ نـەچار؛ بێ‌دەرەتان؛ مەجبوور؛ ناعیلاج ‹فردا نـاگزیر اسـت برود: سبەینێ ناچارە بڕوا›.

**نـاگزیر [2]:** *قیـد.* چـاری‌ناچـار؛ ناچـار؛ بـەناچار؛ نەچاری؛ نەچار؛ بە مەجبووری ‹ناگزیر پیشـنهاد او را پذیرفتم: چاری‌ناچار پێشنیازەکەیم پەسەند کرد›.

**ناگزیری / nāgozîrî/:** *اسم.* ناچـاری؛ نـەچاری؛ بێ‌دەرەتانی؛ مەجبووری؛ نـاعیلاجی؛ دۆخ یـان چۆنیەتی ناچار بوون.

**ناگسستنی / nāgosastanî ، ـها/:** *صفت.* نـەپس؛ نەبڕ؛ نەچڕ؛ نەپچڕ؛ لێک‌بەرنەبوو.

**ناگفته / nāgofte/:** *صفت.* نـەگوتراو؛ نـەوێژیاگ؛ نەکوتە؛ نەگوتە؛ نەگۆتی؛ نەواچیا.

**ناگوار / nāgovār/:** *صفت.* دڵـتەزێن؛ نـاخۆش؛ دڵنەخواز؛ ناحەز ‹خبر ناگوار: هەواڵی دڵتەزێن›.

**ناگویی / nāgûyî/:** *اسم.* زوان‌بـەگیری؛ تـوری؛ لاڵ‌وپاڵی؛ کـەم‌وکـووڕی لـە دەربـڕینی وشـە و ڕسـتەدا بـە بۆنـەی ناتـەواوی دەم و زمـان و ددانەوە.

**ناگه / nāgah/:** *قید.[مخفف]* ناکا؛ ناکاو؛ ناقا؛ لەپڕ؛ کـوت‌وپـڕ؛ گوزوگومبـەت؛ یەکـەو؛ ناخـافڵ؛ یەکتەن؛ لە پڕێکا؛ ژنشکاڤ.

**ناگهان / nāgahān/:** *قیـد.* ناکـاو؛ نـەکاو؛ نکـاو؛ نوکم؛ لە ناکـاو؛ لـە نکـاو؛ کـت‌وپڕ؛ کـوت‌وپـڕ؛ ناخـافڵ؛ لەپـڕ؛ یەکتـەن؛ لـە پـڕێکا؛ شکێڤـە؛ ژنشکاڤ؛ هەنی؛ گزوگوم؛ گزوگومەت؛ لـەهێک؛ لەهێکرا؛ لەپڕا؛ نش؛ ناخلاف؛ بێ‌خەبەر؛ کـرپ؛ بەبێ ئاگاداری لە پێشەوە.

**ناگهانی / nāgahānî/:** *صـفت.* کـوت‌وپـڕی؛ کت‌وپڕی؛ کرمۆس؛ نوهەڵـمونە؛ ناگـەهانی؛ بـە دوخ یا چۆنیەتیێکی چاوەڕوان‌نـەکراوەوە ‹بـلای ناگهانی: بەڵای کوت‌وپڕی›.

**نالان / nālān/:** *قیـد.* نالەناڵ؛ بە نکەوە؛ بە نـک و نالە؛ بە نالەوە؛ نالان؛ بـە نالەنالـەوە؛ بـە نـک و نالەوە ‹گریان و نالان به مادرش پناه برد: بە گریـان و نالەناڵ هانای برد بۆ دایکی›.

**نالـه / nāle ، ـهـا/:** *اسم.* نالـە؛ وت: ١. نـووزە؛ نک‌وناڵ؛ ئاخ و ئۆف لە بـەر دەرد و خـەم ‹از درد ناله می‌کرد: لـە ئێشـانا نـک‌ونالـی بـوو› ٢. *[کنایی]* قسەی لە ڕووی گلە و بناشتەوە ‹از دست شوهرش ناله داشت: بە دەست شووەکەیەوە دەینالاند›.

▣ **ناله کـردن:** نالـین؛ نالـەناڵ کـردن؛ نالانـدن؛ نکین؛ نالەی؛ نکەی.

**نالیدن / nālîdan/:** *مصدر. لازم.* // **نالیدی:** نالـیت؛ **می نالی:** دەنالی؛ **بنال:** بناڵە // نالین؛ نالان؛ نالانن؛ نالاندن؛ نالای؛ نالـەی؛ گالـین؛ نکـین؛ نکـەی؛ نـارین؛ کسکسـین؛ نزانـدن؛ زمـیهتن؛ زمـین؛ نالایش؛ نالەنـە؛ ئاخنیـک ڕاهـیلان: ١. لـە بـەر ئێش و ژان دەنگ بەرزکردنەوە ‹از درد نالیدن: لـە ئێشا نالاندن› ٢. کڕووزانەوە؛ ئەوەکڕووزیەی؛ بـۆ بزواندنی بـەزەیی یـان هـاودەردی کەسـێ، بـە شین و ناڵە لە بار و دۆخی خۆ گلەیی کردن.

■ صـفت مفعـولی: **نالیـده** (نالـیو)/ مصـدر منفـی: **ننالیدن** (نەنالین)

**نام / nām ، ـهـا/:** *اسم. [ادبی]* ١. نێو؛ ناو؛ ناڤ؛ نام؛ نامێ؛ نۆم؛ نـووم؛ نۆمـە؛ وشـەی پـێ‌ناسـین بـۆ کەسـێ یـان شـتێ ٢. ناوبانـگ؛ دەنـگ‌ونـاو؛ ناڤدەنگ.

▣ **نام تجارتی:** نـاوی بازرگـانی؛ ناوێـک کـە بـۆ ناسینەوەی کاڵایەک بۆی داندراوە ‹دیوتروم نـام تجاری نوعی آبگرمکن است: دیۆترم ناوی بازرگانی جۆرێک ئاوگەرمکەرە›.

نام خانوادگی: ناوی بنەماڵە؛ ناوێکی هاوبەش (لە زۆرێ وڵاتاندا) لە نێوان ئەندامانی بنەماڵەی باوکیدا: **نام فامیل**

نام علمی: ناوی زانستی؛ ناوێ کە لە ڕشتەییێکی زانستی دیاریکراودا بۆ بەرد، گیا، گیانەوەر یان هەر ماکێکی‌تر دادەنرێ.

هەروەها: **نام شیمیایی؛ نام طبی**

نام فامیل ☜ **نام خانوادگی**

به نام: بە ناوی؛ بە نێوی؛ بە ناو؛ وە ناو؛ بە نامۆ؛ بە نامێ: ۱. وێڕای بیر هێنانەوە و بەسەر کردنی ناو و یادی کەسێک یان شتێک ‹به نام خدا: بە ناوی خوا› ۲. بە پشتیوانی و ڕەچاو کردنی بایەخی کەس یان شتێکەوە ‹به نام قانون: بە ناوی قانوون› ۳. خاوەن ناو ‹پسری داشت به نام آزاد: کوڕێکی بوو بە ناوی ئازاد›.

◙ نام بردن از کسی/ چیزی: نێو/ ناو بردن لە کەسێک/ شتێک؛ ناو هانین/ هاوردن لە کەسێ/ شتێ: ۱. ناو ئەو شتە/ کەسە بردن ‹چهار حیوان کوهی را نام ببرید: چوار ئاژەڵی کێوی ناو ببەن› ۲. سەبارەت بەو کەسە/ شتە قسەکردن ‹در آن بحث از شما هم نام بردیم: لەو باسەدا، ناوی ئێوەشمان برد›.

نام دادن: ناو نان؛ ناو پێوەنان؛ نام نیەی ‹به آن قاره آمریکا نام دادند: ئەو قوڕنەیان ئەمریکا ناو نا›.

نام گرفتن: ناو نران؛ ناسران؛ بەو ناوەوە ناسران؛ ناو دەرکردن؛ نام نریەی ‹محلّەی ما جورآباد نام گرفت: گەڕەکی ئێمە جەوراوا ناو برا›.

نام نوشتن: ناو نووسین؛ ناف نوسین؛ نێو نووسین؛ نام نویستەی.

نام نهادن بر کسی/ چیزی: *[ادبی]* ناوی کەسێک/ شتێک نان؛ ناو نیان؛ نامێ نیای ‹او را آرام نام نهادند: ناویان نا ئارام›.

**نام‌آوا** / nāmāvā ، ـها:/اسم. ناودەنگ؛ وشەیەک کە گوتنی دەنگێک بەدی‌دێنێ وەکوو دەنگی ئەو شتە بۆخۆی (وەک: بووم، فش‌فشە، شیرشیرە، سیسرە و...).

**نام‌آور** / nāmāvar ، ـها؛ ـان/:اسم. بەناوبانگ؛ ناودار؛ بە ناو و دەنگ؛ ناسراو؛ ناسیاگ ‹مردی نام‌آور بود: پیاوێکی بەناوبانگ بوو›.

**نامادری** / nāmādarî ، ـها:/اسم. زڕدایک؛ زڕداک؛ زڕداڵک؛ زڕدێ؛ باوەژەنی؛ باوەژن؛ باواژن؛ دێدێ؛ دیدی؛ داماک؛ داماری؛ ژن‌باف؛ دامەهر؛ دێ‌ماری؛ مێرێ.

**نامبرده** / nāmborde ، ـها؛ ـگان/: ضمیر. نێوبراو؛ ناوبراو؛ ناوبریاگ؛ ناف‌بری؛ ناف‌گوتراو؛ باسکراو؛ ناف‌ئینای ‹نامبرده سالها دور از وطن بوده است: ناوبراو زۆرسالان لە نیشتمانی دوور بووە›.

**نامتداول** / nāmotadāvel, -motedāvel/: [فارسی/ عربی] *صفت*. نائاسایی؛ ناباو؛ نەباو ‹شیوەی نامتداول: شێوازی نائاسایی›.

**نامترقب** / nāmotaraqqeb, -moteraqqeb/: [فارسی/ عربی] ☜ **غیرمترقبه**

**نامترقبه** / nāmotaraqqebe, -moteraqqebe/: [فارسی/ عربی] ☜ **غیرمترقبه**

**نامتناهی** / nāmotanāhî, -motenāhî/: [فارسی/ عربی] *صفت*. بێ‌بن؛ بێ‌پەڕ؛ دوانەهات؛ بێ‌کۆتایی؛ بێ‌دوایی؛ دوانەبڕاو؛ بێ‌سنوور؛ بێ‌کۆتاهی ‹جهان نامتناهی: جیهانی بێ‌بن›.

**نامحرم** / nāmahram ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. نامەحرەم: ۱. *[اسلام]* ژنێ کە بە پێی شەرع نابێ پیاوێک چاوی بە سەر و قژ و لەشی بکەوێ ۲. *[اسلام]* پیاوێ کە شەرع ڕێ نادا ژنێک دەستی لێ‌بکەوێ ۳. دگەر؛ بێگانە؛ کەسێ کە جێ بڕوا نیە و نابێ قسەیەکی لە لا بکرێ *

بەرانبەر: **محرم**

**نامدار** / nāmdār ، ـها؛ ـان/: *صفت*. بەناوبانگ؛ ناقدار؛ ناقدێر؛ ناودێر؛ بە دەنگ و ناو؛ نێودار؛ نامدار؛ نامەدار؛ نامی؛ ناوی؛ نامیە؛ نۆمدار؛ گەپ؛ خودان دەنگ و ناف ‹شاعر نامدار: هەستیاری

بەناوبانگ›.

**نامراد** / nāmorād/: [فارسی/ عربی] *صفت.* نامراد؛ ناکام؛ نابەکام؛ بە ئاوات یان ئامانج نەگەیشتوو.

**نامرادی** / nāmorādî ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* نامرادی؛ ناکامی؛ نابەکامی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نەگەیشتن بە ئاوات یان ئامانج.

**نامرئی** / nāmar'î/: [فارسی/ عربی] *صفت.* نادیار؛ نەدیار؛ ناخویا؛ بەرپێوار؛ پێوار؛ ناپەیا؛ نە لەبەر چاو ‹مرد نامرئی: پیاوی نادیار›.

**نامربوط** / nāmarbût/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ١. پەرت؛ لابەلا؛ بێ‌پێوەندی پێکەوە یان دەگەڵ بابەتی مەبەستدا ٢. نەشیاو؛ نەوەشاو ‹حرفهای نامربوط زده بود: قسەی نەشیاوی کردبوو›.

**نامرتب** / nāmorattab/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ناورتە؛ ناجۆر؛ نارێک؛ شپرێو؛ شپرزە؛ شێویاگ؛ قەوچل؛ گلەنجوو؛ تێکەڵ‌پێکەڵ؛ بێ‌ڕێک‌وپێکی.

**نامرد** / nāmard ، ـها؛ ـان/: *صفت.* ١. نامەرد؛ نەمەرد؛ ناپیاو؛ ناپیا؛ ناپیاگ؛ کۆژۆ؛ لە مەردایەتی بە دوور ٢. نامرۆڤ؛ نەمرۆ؛ نامرۆ؛ هۆڤەبەر؛ خوێڕی؛ خۆڕی؛ گەندەپیاو؛ بێ‌بەش لە بایەخگەلی هێژای مرۆڤانی.

**نامردی** / nāmardî ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* نامەردی؛ ناپیاوی؛ خوێڕیەتی؛ ناپیاوەتی.

**نامردمی** / nāmardomî ، ـها/: *اسم. [ادبی]* نامەردی؛ ناپیاوی؛ ناپیاوەتی؛ نامرۆڤی.

**نامرغوب** / nāmarqûb/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ١.بەلەک؛ ئەیاغ؛ چرووک؛ مەراش؛ دزگین؛ بەبێ چۆنیەتی پێویست بۆ کەڵک لێ گرتن ٢. بێ‌نرخ؛ بێ‌بایەخ.

**نامزد** / nāmzad ، ـها/: *اسم.* ١. ناودێر؛ ناڤدێر؛ ناڤدایی؛ ناو لەسەر؛ دیاریکراو بۆ کارێک ‹نامزد دریافت جایزه: ناودێری وەرگرتنی خەلات› ٢. دەزگیران؛ دەسگیران؛ دەزووران؛ دەزیران؛ دەزبیران؛ دەزویران؛ دەرگست؛ دەلەندە؛ دەرگستی؛ دەزگرتی؛ دەزگر؛ دەسگر؛ دەستگر؛ دەستگرتی؛ دەسگیرۆ؛ هلف؛ کیژ و کوڕ یان ژن و پیاوێ کە بڕیارە ببنە ژن و شوو.

▣ نامزد انتخاباتی: ناڤدایی؛ ناڤدێر؛ کاندیدا؛ ناودێری هەڵبژاردن.

**نامزدبازی** / nāmzadbāzî ، ـها/: *اسم.* دەزگیرانبازی؛ دەزووران‌بازی؛ پێوەندی ئەویندارانەی نێوان کوڕ و کچی لێک‌ناوبراو.

**نامزدی** / nāmzadî/: *اسم.* ١. ناودێری؛ ناڤدێری؛ ناوزەدی؛ کار یان ڕەوتی دەستنیشان کران بۆ کارێ ٢. /ـها/ دەزگیرانی؛ شیرینی‌خۆران؛ دەزوورانی؛ ڕێ‌وڕەسمی دیاری‌کردنی دووکەس وەک ژن و مێردی داهاتووی یەک.

**نامساوی**[1] / nāmosāvî ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم.* نابەرامبەر؛ نەهەمبەر: ١. تایبەتمەندی بەرامبەر نەبوون ٢. نوانێ بە شێوەی ≠ لە بیرکاریدا کە نیشانەی نابەرامبەری دوو ژمارەیە.

**نامساوی**[2]: *صفت.* نابەرامبەر ‹دو خط نامساوی: دوو دێڕی نابەرامبەر›.

**نامطبوع** / nāmatbû'/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ناحەز؛ دڵنەخواز؛ دڵنەویست.

**نامطلوب** / nāmatlûb/: [فارسی/ عربی] *صفت.* نەشیاو؛ نالایەق؛ ناهێژا؛ ناحەز؛ ناپەسند؛ گەن؛ نابەدڵ ‹وضع نامطلوب: بار و دۆخی نەشیاو›.

**نامعقول** / nāma'qûl/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ١. نابەجێ؛ نابەجا؛ دوور لە ئاوەز ٢. *[گفتاری]* گەوج؛ نەفام؛ ناماقووڵ؛ تایبەتمەندی ئەو کەسەی کردەوەی دوور لە ئاوەزە.

**نامعهود** / nāma'hûd/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ١. ڕەچاونەکراو؛ بێ‌پێشینە ‹رفتار نامعهود: ئاکاری ڕەچاونەکراو› ٢. نەناسراو ‹موضع نامعهود: هەڵوێستی نەناسراو›.

**نامفهوم** / nāmafhûm/: [فارسی/ عربی] *صفت.* گۆنگ؛ فامنەکراو؛ مانانەزاندراو.

**نامگان** / nāmgān/: *اسم.* زاراوەگەل؛ ناوگەل؛ سەرجەمی ناو و دەستەواژەی تایبەت بە لقێکی

زانست یان هونەر (وەک گیاناسی، قانوون و...).

**نامگذاری** / nāmgozārî ، ـها/: *اسم.* کار و ڕەوتی ناو نان؛ ناڤ دانین؛ ناو لێنان؛ ناو نیان؛ ناودێرکردن ‹ نامگذاری این خیابان برای پنجمین بار بود!: ناونانی ئەم شەقامە بۆ پێنجەمین جار بوو!›: **اسم‌گذاری**

**نامگرایی** / nāmgerāyî/: *اسم. [فلسفه]* بڕوا بەوەی کە هیچ شتێکی گشتی و سەرجەم نیە و بیر بۆی نابێ هیچ مانا یان وێنەیەکی گشتی پێک‌بێنێ یان لێک‌بداتەوە: **اصالت اسم**

**نامِلایم** / nāmolāyem ، ـها؛ ـات/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ناحەز؛ ناخۆش؛ سەخڵەت؛ نابەدڵ؛ ناوەش؛ نالەبار ‹حرف نامِلایم: قسەی ناحەز›.

**نامِلایمی** / nāmolāyemî ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* نالەباری؛ ناخۆشی؛ ناوەشی ‹نامِلایمی روزگار: نالەباری ڕۆژگار›.

**نامنامه** / nāmnāme ، ـها/: *اسم.* ناونامە؛ ناڤنامە؛ فەرهەنگی ناو: ١. فەرهەنگێ کە هەموو ناوێک، بەتایبەت ناوی کەسانی بە پێی تەرتیبی ئەلفوبێ تێدا ڕیزکراوە ٢. پێڕستی ناوی کەسان و جێگاکان لە بەشی دواییینی بڕێ کتێبدا.

**نامنتظر** / nāmontazer/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ڕەچاونەکراو؛ خاوەن بار و دۆخی دوور لە چاوەنواڕی.

**نامنظم** / nāmonazzam/: [فارسی/ عربی] *صفت.* شپرز؛ بڵاو؛ نەپوخت؛ ناپوخت؛ کاربڵاو؛ بە شێوەیەکی شێوا و ئاڵۆزاو.

**نامنویسی** / nāmnevîsî ، ـها/: *اسم.* ناونووسی؛ ناڤنڤیسی؛ کار و ڕەوتی نووسینی ناو لە شوێنێ بۆ بەشداری کردن لە کارێکدا ‹نامنویسی دانش‌آموزان: ناونووسی خوێندکاران›: **اسم‌نویسی**

**نامور** / nāmvar ، ـان/: *صفت. [ادبی]* نامی؛ ناودار؛ ناڤدار؛ نۆمدار؛ بەناڤ؛ بەناوبانگ؛ خاوەن‌ناو؛ سەرناس؛ بە دەنگ و ناو؛ بەناو؛ ناسراوی خەڵک (زۆرتر لەگەڵ ڕێز و خۆشەویستیدا).

**ناموس** / nāmûs ، ـها؛ نَوامیس/: [معرب از یونانی] *اسم.* ناموس؛ ناموس: ١. ئابڕوو؛ شەرەف؛ سەربەرزی ‹در این جنگ، ما دفاع از ناموس کردیم: ئێمە لەم شەڕەدا ئابڕوومان پاراست› ٢. *[مجازی]* ژن، دایک، خۆشک یان کچی پیاو کە پاراستنی ئابڕوویانی لە ئەستۆدایە ‹چشم به ناموس مردم داشت: چاوی لە دووی ناموسی خەڵک بوو› ٣. ڕێوشوێن؛ پێودان؛ قانوون؛ یاسا؛ ڕەسم و شێواز ‹تولد و مرگ، ناموس طبیعت است: زان و نەمان ڕێوشوێنی سروشتە›.

**ناموسی** / nāmûsî/: [معرب] *صفت.* ناموسی؛ پێوەندیدار بە ناموسەوە ‹فحش ناموسی: جنێوی ناموسی›.

**ناموفق** / nāmovaffaq/: [فارسی/ عربی] *صفت.* سەرنەکەوتوو؛ سەرنەکەوتە؛ تێشکاو؛ بە ئاکام نەگەیشتوو ‹مرد ناموفق: پیاوی سەرنەکەوتوو›.

**نام و نان** / nām-o-nān/: *اسم. [کنایی]* ناو و نان؛ پارە و پایە؛ ناو و دەنگ؛ ناوبانگ و دارایی ‹هدفش از این کار رسیدن به نام و نان بود: مەبەستی لەم کارە گەیشتن بە ناو و نان بوو›.

**نامه**[1] / nāme ، ـها/: *اسم.* ١. نامە؛ نەمەک؛ کاغەز؛ نووسراوەیەک بۆ کەسێکی تایبەت و دیاریکراو ‹نامه به یک دوست: نامە بۆ هاوالێک› ٢. نامە؛ نەمەک؛ کاغەزێک کە نامەی تێدا نووسرابێ ‹نامه را پاره کرد: نامەکەی دڕی› ٣. *[مجازی]* بڵاڤۆک؛ گۆڤار.

▣ **نامه‌ی اداری**: نامەی مەزرینگەیی؛ نامەیەک کە بۆ مەزرینگەیەک بنووسرێ یان لە لایەن مەزرینگەیەکەوە نووسرابێ. هەروەها: **نامەی بازرگانی؛ نامەی دوستانە**

**نامه‌ی اعمال**: کارنامە: ١. نامەی کردەوە؛ نامەیەک کە وەک ئێژن، دوو فریشتەی سەرشان، کردەوەی باش و خراپی تێدا دەنووسن ٢. پسوولەی سیایی کارێ کە کراوە.

**نامه‌ی بی امضا**: نامەی بێ‌نیشان؛ نامەی بێ‌واژۆ؛

نامەیەک کە نووسەرەکەی خۆی نەناساندووە.
**نامەی رسمي:** نامەی میری؛ نامەی فەرمی؛ نامەیەک کە بۆ مەبەستێکی کاری یان مەزرینگەیی نووسراوە.
**نامەی سرگشادە:** نامەی سەرکراوە؛ نامەی سەرئاوەلا؛ نامەیەکی رامیاری، کۆمەلایەتی یان... بۆ کەسێکی تایبەت، کە بە مەبەستی ئاگاداری هەمووان بلاو دەبێتەوە.
**نامەی سفارشي:** نامەی راسپاردە؛ نامەی سفارشی؛ نامەیەک کە بە پۆستەی راسپاردە، بۆ شوێنێک بەرێ دەکرێ.
**نامەی هوايي:** نامەی ئاسمانی/ هەوایی؛ نامەیەک کە بۆ زووتر گەیشتن، بە پۆستەی ئاسمانی بەرێدەکرێ. هەروەها: **نامەی زمینی**
▣ **نامەی فدایت شوم فرستادن/ نوشتن:** *[تعریض]* قوربان و ساقە بوون؛ بە سەر و دەست پێدا کەوتن (تێبینی: کاتێ دەگوترێ کە بیانەوێ بێژن کەسێ هاتنی بۆ شوێنێک یان وەئەستۆ گرتنی کار و بارێک بە ویستی خۆی بووە، نەک بە داخوازی کەسی تر) ‹شما خودتان خواستید استخدام شوید، نامەی فدایت شوم برایتان نفرستادە بودیم: ئێوە بۆ خۆتان بەنیاز بوون دامەزرێن، ئێمە خۆ نەکەوتبووینە سەر دەست و پێتان›: **کاغذ فدایت شوم فرستادن/ نوشتن**
**ـ نامە[2]:** *پیواژه.* ـ نامە؛ نووسراوەیەک لەمەڕ مەبەستێکەوە ‹سوگندنامە؛ رزمنامە: سوێندنامە؛ شەڕنامە›.
**نامەبر / nāmebar**، ـها؛ ـان/: *اسم.* نامەبەر: ۱. تەتەر؛ ئەوی نامە دەبا و دێنێ ‹کبوتر نامەبر: کۆتری نامەبەر› ۲. پەیک؛ پۆستەچی.
**نامەپراني / nāmeparānî**، ـها/: *اسم.* *[تعریض]* نامەبازی؛ کار و ڕەوتی پەیتا ـ پەیتا نووسین و دانی نامە بە کاربەدەستان بۆ گەیشتن بە مەبەستێک ‹همینکه آقا وزیر شد، شروع کرد به نامەپرانی که ما چاکریم و ما نوکریم!: کابرا هەر بوو بە وەزیر، دەستی کرد بە نامەبازی کە ئەمن بچووکم، ئەمن نۆکەرم!›.
**نامەرسان / nāmeresān**، ـها؛ ـان/: *اسم.* نامەبەر؛ پەیک؛ پۆستەچی؛ ئەوەی کاری گەیاندنی نامەیە.
**نامەرساني / nāmeresānî**، ـها/: *اسم.* نامەبەری: ۱. کار و ڕەوتی گەیاندنی نامە بە دەستی خاوەنی ۲. کاری پەیک.
**نامەنگاري / nāmenegārî**، ـها/: *اسم.* کاری نامە نووسین؛ دەسخەت نووسین.
**نامەنما / nāmenemā**، ـها/: *اسم.* دەفتەری ئەندیکاتور؛ دەفتەری تۆمارکردنی ژمارە و مێژوو لەگەڵ کورتەی مەبەستی نامەگەلی هاتوو یان ناردراو، لە مەزرینگەیەکدا.
**نامي / nāmî**، ـها؛ ـان/: *صفت.* بەناوبانگ؛ نامی؛ ناودار؛ نامدار؛ بە دەنگ و ناو؛ بەناڤ؛ خاوەن ناو؛ سەرناس؛ ناسراوی خەڵک (زۆرتر لەگەڵ ڕێزدا) ‹نویسندەی نامي: نووسەری بەناوبانگ›.
**نامیدن / nāmîdan**/: *مصدر. متعدی.* *[ادبی]* // **نامیدی:** ناوتنا؛ **مي‌نامي:** ناودەنی؛ **بنام:** ناوبنە // ۱. ناو نان؛ ناو نیان؛ ناو لێنان؛ بناڤ کرن؛ نام نیەی؛ هەڵبژاردن و دیاریکردنی ناوێک ‹او را آزاد نامیدند: ناویان نا ئازاد› ۲. *[نامتداول]* ناو بردن؛ بە ناو بانگ لێکردن؛ وتنی ناوی کەسێک لە کاتی بانگکردنیدا. هەروەها: **نامیدني**
■ **صفت مفعولي: نامیده** (ناونراو)/ **مصدر منفي: ننامیدن** (ناو نەنان)
**نامیزان[1] / nāmîzān**/: [فارسی/ عربی] *صفت.* نامیزان؛ نارێک: ۱. نابەرانبەر؛ ناهەمبەر؛ نامیزان؛ ناتراز ‹چوب‌پردە نامیزان است: چێوپەردەکە نارێکە› ۲. ناکۆک؛ تایبەتمەندی ئەو شتەی ڕێک نەکراوە ‹ساعت نامیزان است: کاتژمێرەکە نارێکە› ۳. *[گفتاری]* شێواو؛ تێکچوو؛ تایبەتمەندی کەسێک وا لە باری ئاوەزەوە ئالۆزاوە.
**نامیزان[2]:** *قید.* ناتەواو؛ نارێک ‹ماشین نامیزان کار

می‌کند: ماشینەکە ناتەواو کار دەکا›.

نامیزانی / nāmîzānî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* ناڕێکی: *الف)* ناترازی؛ نابەرانبەری؛ لاری؛ گێڕی؛ بار و دۆخی ناڕێک بوون *ب)* ناکۆکی؛ ناتەبایی.

نامیمون / nāmeymûn/: [فارسی/ عربی] *صفت.* بەدودم؛ شووم؛ نەحس؛ جووتقۆشە؛ ناموارک.

نان / nān ، ـها/: *اسم.* نان؛ نو؛ نۆ؛ نانە؛ نۆن؛ نوون: ١. بەرهەمی ئاردی دە ئاو شێلدراوی پانەوەکراوی بە ئاگر برژاو ٢. *[کنایی]* پێخۆر و خوراکی ڕۆژانە ‹او از زور بازویش نان می‌خورد: بە هێزی باسکی نانی دەردێنا› ٣. *[کنایی]* بژیوی ژیان ‹باید کار کنیم و نان دربیاوریم: دەبێ کار بکەین و نان دەربێنین› ٤. داهات؛ مووچە ‹با نان کارمندی مگر می‌شود زندگی کرد؟!: کێ بە نانی کارمەندی دەژی؟!›.

▣ نان ارزن: گالین؛ گالینە؛ گارس؛ گێتە؛ گێتکە؛ کیتکە؛ نانی هەرزن؛ نانێ کە لە ئاردی هەرزن چێ دەبێ، زرو و تفتە. هەروەها: **نان جو؛ نان ذرت؛ نان گندم**

نان باگت: نانی لەفە؛ نانی باگیت؛ نانێکی درێژی گرۆڤەرە لە ئاردی سپی دروستی دەکەن.

نان بخور و نمیر: *[مجازی]* مەمرە و مەژی؛ بخۆ و بژی ‹ بد نبود، نان بخور و نمیری داشتیم: خراپ نەبوو، مەمرە و مەژییەکمان هەبوو›.

نان برشک: نێو برێشک؛ ناوبرێشک؛ نان برێشک؛ داروو‌کەیێکی لە تیرۆک باریکتر کە نانی سەر ساجی پێ ئەودیو ئەمدیو دەکەن.

نان برنجی: نان برنجی؛ نان برینجی: ١. نانی چێکراو لە ئاردی برنج ٢. جۆرێ شیرینی کە لە ئاردەبرینج و شەکەر و شتانی بۆنخۆش چێدەکرێ. هەروەها: **نان نخودچی**

نان پنجرەای: نان پەنجێرەیی؛ جۆرێ شیرینی تورت و سووکەڵە لە شیر و هێلکە و هێندێک نشاسە یان ئارد و بۆنخۆشی.

نان تافتون: تافتوون؛ جۆرێ نانی گەنمە لە نانی لەواش بچووکتر بەڵام ئەستوورترە.

نان تنوری: پەنجەکێش؛ پەنجەکێشی؛ نانی تەندووری؛ نان تەنوور؛ نانێ کە بە تەندوور برژابێ.

نان جو: جۆین؛ جوین؛ نانی جۆ؛ نانێ یەوینە.

نان خامەای ☜ **نانخامەای**

نان خشخاشی: نانی سیاوڵە؛ نانێ کە پێش برژان هێندێک سیاوڵە یان کونجی بە سەردا پژابێ.

نان خشکار: نان بۆر؛ نانێکی وەک لەواش بەڵام سۆسەکەی لێ نەپاڵێوراوە و بۆردەکاتەوە.

نان دوآتشە: شاتە؛ پەلەپقە؛ نانی دوو جار بە ئاگرەوە نراو؛ نانی دوو لا برژاو.

نان روغنی ☜ **نانروغنی**

نان ساج: لاباسە؛ نانساجی؛ نان سێڕ؛ نانی سێڵی؛ نانی دێمانێ؛ نانێ کە لە سەر سێڵ دەبرژێ.

نان ساندویچ ☜ **نان سفید**

نان سفید: نانی سپی؛ هەموو جۆرە نانی ئەستووری بە ئاردی سپی درووستکراو، بەتایبەت نانێکی گرۆڤەری چکۆلە کە ساندویچی پێ دروست دەکەن: **نان ساندویچ**

نان شب: *[کنایی]* نانی شەو؛ خواردنی پێویستی شەو و ڕۆژ.

نان شیرمال: نان شیرماڵ؛ نانێ کە هەویرەکەی لە ئارد و شیر دروستکراوە.

نان شیرینی: شیرینی وشک؛ نان وشک؛ جۆرێ شیرینی بەبێ خامە و کرێم.

نان فانتزی: سەموون؛ نانی ماشینی؛ نان فانتزی؛ هەموو جۆرە نانی بە سەرجەم و لە تەندووری ماشێنی چێکراوە: **نان ماشینی**

نان فتیر: فەتیرە؛ فەتیر؛ لۆس؛ لۆش؛ نانێ کە هەویرەکەی هەڵنەهاتبێ.

نان قندی: نانەقەنی؛ چۆرەک؛ کوماچ؛ کۆماج؛

گالگالی؛ بۆرەن‌کووره؛ جۆرێ نان کە لە هەویرەکەیدا ئاردەقەن یان شەکر دەکەن. هەروەها: **نان شکری**

**نان گدایی:** *[مجازی]* نانی سواڵ؛ نانی دەرۆزەیی؛ پووڵ و پارەیێ کە لە گەداییەوە بەدەست بێ. هەروەها: **نان نوکری**

**نان ماشینی** ☜ **نان فانتزی**

**نان مفت:** *[مجازی]* نانی بەلاش؛ نان مفتە؛ ژیان بە سەر بردن لە سەر دەستی خەڵکی.

▣ **نان به دامن کسی گذاشتن:** *[کنایی]* نان نیانە سفرە/ داوێنی کەسێک؛ نان خستنە داوێنی کەسێک؛ کار و داهاتێک بۆ کەسێ دۆزینەوە ‹**می‌خواست** نانی به دامن دامادش بگذارد: **ئەیویست** نانی بنیتە سفرەی زاواکەی›.

**نان به کسی قرض دادن:** *[کنایی]* نان دانە قەرز بە کەسێ؛ لاگیری‌کردن لە کەسێ، بە نیازی وەرگرتنی پشتیوانی ئەو.

**نان به نان کسی نرسیدن:** *[مجازی]* نانی کەسێ بە دۆی نەگەیشتن؛ دەستی کەسێ نەگەیشتنە دەمی؛ یەکجار هەژار و داماو بوون ‹نان به نانمان نمی‌رسد: نانمان به دومان ناگا›.

**نان به نرخ روز خوردن:** *[مجازی]* لە هەر لایەکەوە با بێ شەن‌کردن؛ لە هەموو ئاراشێ باراشی خۆ لێکردن؛ هەلپەرست بوون ‹**او دارد** نان به نرخ روز می‌خورد **و از کسی که سر کار است تعریف می‌کند:** له هەر لایەکەوە با بیت شەن دەکا **و دەم بۆ ئەوەی لە سەر کارەوە بێ، دەتەقێنێ**›.

**نان پختن:** نان کردن/ پێژان/ براژتن/ پاتن/ پەتەی.

**نان پشت شیشه مالیدن:** *[کنایی]* گوو وشکەوکردن؛ پۆس تس گرتنەوە؛ زۆر رژد و چکووس بوون.

**نان توی کاری بودن:** *[مجازی]* نان لە کارێکدا بوون؛ قازانجی زۆر لە کارێک بەرهەم هاتن ‹**این روزها** نان توی معامله است: **ئەمرۆکە** نان لە مامەڵەدایە›.

**نان چیزی / کسی را خوردن:** نانی شتێک/ کەسێک خواردن؛ بەو بۆنەوە کار لە پێش بردن ‹نان قلبش را می‌خورد **نه قلمش:** نانی دڵی دەخوا **نەک قەڵەمی**›.

**نان خود را خوردن و هلیم حاج عباس را هم زدن:** کوتەک ناو چڵپاو بوون؛ بە نەزانی و بەبێ هیچ قازانجێک خۆ تووشی کێشەکردن.

**نان خوردن:** *[کنایی]* نان دەرهێنان؛ نان دەرهاوردن؛ نان بەرئاردەی؛ بەدەست هێنانی بژیوی رۆژانە و رابواردنی ژیان ‹نان خوردن **زحمت دارد:** نان دەرهێنان **سەختە**›.

**نان کردن:** بوونە نان و ئاو؛ بە نان بوون؛ بەهرە و قازانجدار بوونی کارێک ‹**این کار برایمان** نان نمی‌کند: **ئەم کارە** نابێتە نان و ئاو **بۆمان**›.

**نان کسی آجر شدن:** *[مجازی]* نانی کەسێک بڕان؛ نەمانی داهات و بژیوی ژین ‹**کارمان خوابید و** نانمان آجر شد: **کارەکە پەکی کەوت و** نانمان بڕا›. هەروەها: **نان کسی را آجر کردن**

**نان کسی توی روغن بودن:** *[کنایی]* پارووی کەسێک لە رۆندا بوون؛ ئاوی کەسێ بە بێڵیەوە بوون؛ سەرکەوتوو بوون؛ دەوڵەمەند بوونەوە ‹**با این کاری که پیدا کردی، دیگر** نانت توی روغن است: **بەم کارەی دۆزیوتەوە ئیدی** پارووت لە رۆندایە›.

**نان کسی را بریدن:** *[مجازی]* نانی کەسێک برین؛ داهات و بژیوی ژینی کەسێ نەهێشتن ‹**چرا** نان مردم را می‌بری؟: **بۆ** نانی خەڵک دەبڕی؟›.

**نان و آب داشتن** ☜ **نان و آب**

**از نان خوردن افتادن:** *[کنایی]* لە نان خواردن کەوتن/ کەفتن؛ بژیوی ژیان بڕیان ‹**دستم شکست و** از نان خوردن افتادم: **دەستم شکا و** لە نان خواردن کەوتم›. هەروەها: **از نان خوردن انداختن**

به نان شب محتاج بودن: *[مجازی]* بۆ نانی شەو دامان؛ زۆر نەدار و بەلەنگاز بوون.

**نـان‌آور** / nānāvar ، ـهـا/: *صـفـت. [کـنـایی]* نـان‌دەرهێنـەر؛ نـان‌دەرهـاور؛ نانـاوەر؛ نـودرار؛ دابین‌کەری داهات و بژیوی ژیـنی بنەماڵـەیەک ‹او تنها نان‌آور خانه بود: ئەو تەنیا نان‌دەرهێنەری ماڵ بوو›.

**نانای** / nānāy/: *اسم. [کودکانه]* نینای؛ لیـز؛ ئـش؛ هەڵپەڕکێ.

▣ نانای کردن: هەڵپەڕین؛ سەماکردن؛ لەیزتن؛ لیزتن؛ ئش‌کردن/ کەردەی.

**نان‌بر** / nānbor/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* نـان‌بـڕ؛ هوکارە و هۆگری نان‌برین.

**نان‌بری** / nānborî/: *اسم. [مجازی، گفتاری]* کـاری نان برین؛ رزق برین؛ لـەناو بـردنی داهـات یـان بژیوی ژینی کەسێ.

**نان‌بند** / nānband/ ☜ **جُلّت**[1]

**نان‌بیار کبـاب ببـر** / nānbiyārkabāb.bebar/: [فارسـی/ عربـی/ فارسـی] *اسـم.* کـەباب‌ـکـەباب؛ کەواو-کەواو؛ یاریـەکی دوو کەسـە کـە یـەکیان لەپی هەر دوو دەستی دەنێتە سەر دوو دەستی ئەوی دی و ئەوی‌تریان دەکۆشێ لە کوت‌وپڕا لە پشتەدەستی دا، ئەگەر لێیـدا، دیسـانەکە، دەنـا نۆرە دەگۆڕێ.

**نانجیـب** / nānacîb/: [فارسـی/ عربـی] *صـفت.* بەدڕەسـەن؛ ناڕەسـەن؛ نـاجنس؛ نانـەجیب؛ ناوەجـاخ؛ ڕەگـەزچرووک؛ بنیچەخوێـڕی؛ بن‌میتانە؛ ناکەس‌بەچە.

**نـان‌خامـه‌ای** / nānxāme'î ، ـهـا/: *اسـم.* نـانی خامەیی؛ جۆرێ شیرنی کە ناوەکـەی لـە خامـە یان کرێم دەئاخنن.

**نـانخور** / nānxor ، ـهـا/: *اسم.* خێـزان؛ نـانخۆر؛ نـانخوەر ‹بیچـاره هفـت‌سـر نـانخور داشـت: دامـاو حەفت‌سەر حێزانـی هەبوو›.

**نانخورش** / nānxoreš/: *اسم.* پێخـۆر؛ پێخـوەر؛ ناوەرژن؛ ئەوەی بە نانەوە ئەیخۆن.

**ناندانی** / nāndānî ، ـهـا/: *اسـم. [کنـایی، گفتـاری]* دووکـان؛ شـوێن و هـەلی ڕەخسـاو بـۆ دابـینی داهات، پتر بە ناڕەوا.

**نان‌روغنی** / nānrowqanî, -ro:qanî ، ـها/: *اسم.* کولێرەچـەورە؛ کولێرەبەچـەور؛ پشـی؛ جـۆرێ کولێرە کە هەوێرەکەی شەکر و ڕۆنی تێ‌کراوە.

**نان‌کور** / nānkûr ، ـها/: *صفت. [مجـازی، گفتـاری]* نان‌کۆر؛ نان‌کوێر؛ کوێرنـان؛ قەمتـەر؛ نـان‌بژێـر؛ ئـەنگوتک‌بژێـر؛ کنـۆژ؛ کنـۆس؛ سپڵـە؛ سـپڵ؛ بێ‌ئەمەگ؛ ئەمەگ‌نەناس. هەروەها: **نان‌کوری**

**نان‌و آب** / nān-o-'āb/: *اسـم. [مجـازی]* نـان‌وئـاو؛ داهات یان بژیوی ژیان.

▣ نان و آب داشتن: نان و ئاودار بوون؛ نان و ئاو تێدا بوون؛ داهات هێنانە دەس ‹اگر کاری نان و آب نداشته باشد، مگر مرض دارم دنبالش باشم: ئەگەر کارێک نان و ئاودار نەبێ، مەگەر سەرم لێ شێواوە خۆمی بۆ ماندوو کەم›.

**نان‌و آبدار** / nān-o-ābdār/: *صفت. [مجازی]* نـان و ئـاودار؛ بـە تایبەتمەنـدی و دانسـتەی دابـین کردنی داهاتی باشەوە ‹یک کار نان‌وآبدار گیر آوردم: کارێکی نان‌وئاودارم دیوەتەوە›.

**نـانوا** / nānvā ، ـهـا؛ ـیـان/: *اسـم.* نانـەوا؛ نانکـەر: ۱. نان‌برێژ؛ نان‌پات؛ نان‌پێژ؛ نـان‌بژێـر؛ نانەپـەچ؛ شاتر؛ کەسێ کە ئـەنگوتک بـە تـەنوورەوە ئـەدا ۲. ئەوەی لە نانەواخانەدا کار دەکا یان بەڕێوەی دەبا.

**نانوائی** / nānvā'î/ ☜ **نانوایی**

**نـانوایی** / nānvāyî/: *اسـم.* ۱. نانـەوایی؛ کـار و پیشـەی نانـەوا ۲. /ـهـا/ نانواخانـە؛ نانـەوایی؛ نانەواخانە؛ دووکانی تایبەتی نان‌پێـژان ۳. /ـهـا/ فرۆشگای نان * **نانوائی**

**نان و پنیر** / nān-o-panîr/: *اسـم. [کنـایی]* نـان و ماست؛ نان و پەنیر؛ پێخۆرێکی سووک و سـاکار و هەرزان ‹ناهار بیایید خانه‌ی مـا، نـان و پنیـری پیـدا

می‌شود: نیوەڕۆ وەرنە ماڵی ئێمە، هەر نان و ماسێک هەیە›.

**نانوگرم** / nānog(e)ram /: [فرانسوی]/اسم. نانۆگرەم؛ یەکەی پێوانی قورسایی بەرانبەر $10^{-9}$ گرەم.

**نانومتر** / nānometr /: [فرانسوی]/اسم. نانۆمیتر؛ یەکەی پێوانەی درێژایی بەرانبەر $10^{-9}$ میتر.

**نان و نمک** / nān-o-namak /: اسم. [کنایی] نان و نمەک؛ پێخۆر یان بژیوی دابین‌کراو بە یارمەتی یان بە هۆی کەسێک.

▣ **نان و نمک کسی را خوردن**: [کنایی] نمک کەسێ کردن؛ نان و نمەک کەسێ کردن/ خواردن ‹من سال‌ها نان و نمک شما را خورده‌ام و امروز نمی‌توانم شما را تنها بگذارم: ئەمن زۆر ساڵە نمەکتانم کردووە، ئێستا ناتوانم بەجێتان بێلم›.

**نانویسی** / nānevîsî /: اسم. نانووسایی؛ جۆرە ئازارێکی مێشکە دەسەڵاتی نووسین تێک دەدا.

**نانیسم** / nānîsm /: [؟]/اسم. [پزشکی] باواقۆرەتی؛ باوەقۆرتی؛ بستەباڵایی.

**ناو** / nāv ، ـها/: اسم. ١. ناو؛ کەشتی؛ بەتایبەت گەمیەی گەورە و تەیاری شەڕ ٢. ناو؛ گەرۆکێ کە دەتوانێ بە سەر ئاو یان لە ئاسماندا بگەڕێ ‹ناو کیهانی: ناوی کەیهانی› ٣. [نامتداول] پلوور؛ پلووسک.

▣ **ناو هواپیمابر**: کەشتی فرۆکەبەر؛ گەمیەی وا گەورە کە فرۆکەی شەڕی لە سەر بنیشێتەوە.
**ناو کیهانی**: ماشێنی سەفەرکردن بۆ سەرەوەی کەشی زەوی.

**ناوارد** / nāvāred /: [فارسی/ عربی] صفت. [مجازی] لێنەزان؛ نابەلەد؛ ناشی؛ ناشارەزا؛ کۆڵە؛ غەشیم؛ خەشیم.

**ناوبان** / nāvbān ، ـها؛ ـان/: اسم. ناوبان؛ ئەفسەری هێزی چەکداری دەریایی، هاوپلەی سوتوانی هێزی زەوینی.

**ناوبری** / nāvbarî ، ـها/: اسم. کەشتیوانی؛ کار و ڕەوتی گەڕاندنی گەمیە.

**ناوبندان** / nāvbandān /: اسم. ١. کاری بەرگری کردن لە هاتوچۆی گەمیە بۆ سەر ئەسکەلە ٢. فەرمانی گشتی بۆ نەبردنی بارێک بە کەشتی لە لایەن دەوڵەتێک یا بەشدارگەیەکی گەورەوە.

**ناوچه** / nāvče ، ـها/: اسم. لۆتکەی شەڕ.

**ناودان** / nāvdān ، ـها/: اسم. ١. پلوور؛ پلووره؛ پلووسک؛ سوولک؛ لووساوک؛ سوولاو؛ سوولاوک؛ سوولاوکە؛ سوولاڤ؛ لووساو؛ سوول؛ لووس؛ سویل؛ قابوول؛ شوورک؛ بۆخشک؛ چرک؛ چروونەک؛ مێزەفک؛ میزفک؛ ئاورێژ؛ ئاوپەڕ؛ سیل؛ لوولە یان کەرستەیەکی ناوچاڵ بۆ ڕاگوێزانی ئاو لە ڕووبەرێکیەوە بۆ ڕووبەرێکی‌تر، بەتایبەت لە سەربانەوە بۆ خوار.

**ناودانی**[1] / nāvdānî /: اسم. پلووره؛ جۆرێ پرۆفیلی پۆلایی ناوچاڵ (وەک U) بۆ کار و باری پیشەسازی و خانووبەرە.

**ناودانی**[2]: صفت. پلووری: ١. پلووسکی؛ سەر بە پلووسک ٢. وەک پلووسک.

**ناوشکن** / nāvšekan ، ـها/: اسم. ناوشکێن؛ کەشتی‌شکێن؛ گەمیەی شەڕانی بۆ هێرش بردنە سەر کەشتی‌تر.

**ناوک** / nāvak ، ـها/: اسم. ١. سەرەتیر؛ پەیکان؛ نووکی سێ‌سووچ و تیژی تیر ٢. درز، بەتایبەت لە هەندێ تووودا (وەک هی گەنم و پێشەی خورما).

**ناوه** / nāve ، ـها/: اسم. [قدیمی] ناوە؛ دەفری دارینە کە قوڕ و ئاجۆر و بەردیان پێ‌دەگۆزتەوە.

**ناوه‌کش** / nāvekeš ، ـها/: اسم. [قدیمی] ناوەکێش؛ ئەو کرێکارە قوڕی بە ناوە دەکێشا.

**ناوی** / nāvî /: اسم. ١. ـها؛ ـان/ ناوی؛ زریڤان؛ گەمیەوان؛ ئەندامی هێزی چەکداری دەریایی.

**ناهار** / nāhār /: اسم. نەهار: ١. ـها/ فراوین؛ فراوین؛ ڤراڤین؛ قاوەتوون؛ قاوەتی؛ قاوەتووو؛ نیمەڕۆژە؛ نیوەڕۆژە؛ چاش؛ نانی نیوەڕۆ ‹ساعت از دو هم گذشت و هنوز ناهار حاضر نیست: کاتژمێر لە

دوو تێپەڕی و هێشتا فراوین ساز نەبووە›
٢. [گفتاری] نیوەڕۆ؛ نیمەڕۆ؛ کاتی فراوین ‹زودباش! ناهار شد: زووبە! نیوەڕۆیە› ❋ نهار
**ناهاربازار** / nāhārbāzār/: اسم. نەهاربازاڕ؛ جەنجاڵ و زڵەی کاتی نیوەڕۆ، بەتایبەت لەو شوێنانە فراوین دەفرۆشن.
**ناهارخوری** / nāhārxorî، ـها/: اسم. ١. چێشتخۆری؛ شوێنی خواردنی ژەمەن ٢. ☜ اتاق ناهارخوری، **اتاق** ٣. مێزی چێشتخۆری؛ مێزێکی گەورە کە بە دەوریدا دادەنیشن و نان دەخۆن.
**ناهماهنگ** / nāhamāhang/: صفت. ئاڵۆز؛ ناتەبا؛ ناکۆک؛ قرخەمەرەزێ؛ تایبەتمەندی شتێ کە بەشگەلی پێکهێنەری پێکەوە ناکۆکن یان لەگەڵ دەور و بەریدا وێک نایەتەوە. هەروەها: **ناهماهنگی**
**ناهمساز** / nāhamsāz، ـها/: صفت. ناساز؛ نەساز؛ ناسازگار؛ بەبێ هاوچەشنی. هەروەها: **ناهمسازی**
**ناهموار** / nāhamvār/: صفت. نارێک؛ نالەبار؛ ناهەموار: ١. گڕ؛ ناخار؛ پڕکەند و لەند؛ گرناڵ؛ گرناڵ-گرناڵ؛ لابار؛ بەرز و نزم؛ بێ تەختایی و رێکی ٢. [مجازی] دژوار؛ ئارێشە ٣. [مجازی] ناجۆر؛ نەپۆڕ؛ تەوش؛ بە بار و دۆخێکی نائاسایی و بەرگرەوە.
**ناهنجار** / nāhancār/: [فارسی/ سنسکریت] صفت. ناپۆڕ؛ نەپۆڕ؛ ناهەنجار: ١. ناکلۆکار؛ شەنی؛ ناحەز؛ دڵنەخواز؛ کرێت؛ کەرچۆقە؛ نالەبار ‹صدای ناهنجار: دەنگی ناپۆڕ› ٢. نارێک؛ نەگونجاو؛ تەوش؛ ئاڵۆز؛ ناساز لەگەڵ قانون یان دابی کۆمەڵگادا ‹رفتار ناهنجار: کردەوەی ناهەنجار›.
**ناهنجاری** / nāhancārî، ـها/: [فارسی/ سنسکریت] اسم. ناهەنجاری؛ ناپۆڕی؛ نەگونجاوی؛ بار و دۆخی نەسازان دەگەڵ ڕەسم و یاسادا.
**ناهوازی** / nāhavāzî/: [فارسی/ عربی/ فارسی] ☜ **بی‌هوازی**

**ناهید** / nāhîd/ ☜ **زهره**
**نای** / nāy/: اسم. ١. هەفیک؛ ستۆکورک؛ ستۆکوڕ؛ ستۆکوڕک؛ ستۆکرک؛ کشکشێ؛ لوولەی سەرەکی کۆندامی هەناسەدان لە ناقەوە هەتا سەری سی کە هەوا گۆزاوگۆز دەکا ٢. [ـها/ [موسیقی، قدیمی] نەی؛ نای؛ شمشاڵ؛ باڵۆرە؛ باڵوور؛ باڵووری؛ لوولە؛ لوولێ؛ بلوێر؛ بلوور؛ بلول؛ پلور؛ نایە.
**نایاب** / nāyāb/: صفت. نایاب؛ نایەب؛ نابا: ١. قات؛ دەس‌نەکەوت؛ بێ‌وێنە؛ کەموێنە؛ دەس‌نەڕەس ‹نان نایاب شد: نان چووە قات› ٢. نەدۆزراو؛ بەرپێوار ‹برخی جانوران وحشی مانند ببر و شیر در کردستان نایاب است: بڕێ ڕاوری وەک بەبر و شێر لە کوردستاندا نابابن›.
**نای‌انبان** / nāyambān, nāy'anbān/ ☜ **نی‌انبان**
**نایب** / nāyeb، ـها؛ نُوّاب/: [عربی] اسم. ١. بریکار؛ جێگر؛ وەرت؛ دەسیار ٢. [قدیمی] سوتوان؛ ستوان ❋ **نائب**
**نایب‌التولیه** / nāyebottowlîye, -to:lîye، ـها/: [عربی] اسم. جێگر؛ جێگەدار؛ کەسێ کە لە نەبوونی بەرپرسدا کار و باری بەڕێوە دەبا.
**نایب‌السلطنه** / nāyebossaltane، ـها/: [عربی] اسم. جێگری پادشا؛ ئەو کەسەی لە نەبوونی شادا، ئەرکەکانی لە ئەستۆیە.
**نایب‌رییس** / nāyebrayîs, -reyîs، ـها؛ ـان/: [عربی] اسم. جێگری سەرۆک.
**نایب‌قهرمان** / nāyebqahramān, -qahremān، ـها/: [عربی/ معرب] صفت. دووهەم‌پاڵەوان/ قارەمان.
**نایب‌قهرمانی** / nāyebqahramānî, -qahremānî/: [عربی/ معرب] اسم. [ورزش] دووهەم پاڵەوانی/ قارەمانی؛ پلەی دووەمی کێبەرکێی وەرزشی.
**نایپوش** / nāypûš/: اسم. [کالبدشناسی] ناقپۆش؛ گەلا کرۆژنەیەک لە پشت زمانی مۆرەداراندا کە لە کاتی قووتدان، سەر ناق دادەپۆشێ و

ناهێڵێ شتی تێ بچێ: **مُکبّی**

**نــایژک** / nāyjak ، ـهـا/:/اســم. وردەلوولـەی ناوەوەی سی کە هەموو دەچنەوە سـەر یـەک و هەوایان لێوە هاتوچۆ دەکا.

**نایژە** / nāyje ، ـها/:/اسم. هەر کام لـە دوو چڵـی ستۆکرک کە دەچنە سی ڕاست و چەپەوە.

**نایســـتادن** / nayistādan, na'îstādan/ ☜ **ایستادن**

**نایسـتاندن** / nayistāndan, na'îstāndan/ ☜ **ایستاندن**

**نایــل** / nāyel/: [عربـی] صـفت. (پـێ)گەیشـتوو؛ (پێ)گـەییو؛ گەوشـتی؛ بـە شـت یـان شـوێنێ گەیشـتوو ‹بـە دیدارشـان نایـل شـدم: گەیشـتمە خزمەتیان›: **نائل**

**نــایلکس** / nāyleks/: [انگلیسـی]/اسم. نـایلێکس؛ ناوی بازرگانی بۆ پەڕەگەلی ناسکی ئیتیلێنی کە وەک کیسە، ڕووکێش و کەرستەی بەسـتەبەنی بەکاردێن.

**نــایلن** / nāylon ، ـهـا/: [انگلیسـی]/اسم. نـایلۆن؛ دەڵق؛ هـەر کـام لـە جۆرەکـانی پـولیئامیـدی دەســـکرد و پتـــەو کـــە وەک بـــەن و لـــە پلاستیکسازیدا بە کار دێن: **نایلون**

**نــایلنی** / nāylonî/: [انگلیســی] صـفت. دەڵــقی؛ نایلۆنی؛ لە جنسی نایلۆن: **نایلونی**

**نایلون** / nāylon/: [انگلیسی] ☜ **نایلُن**

**نایلونی** / nāylonî/: [انگلیسی] ☜ **نایلُنی**

**نئاندرتال** / ne'āndertāl/: [؟]/اسـم. نیئانـدرتاڵ؛ مرۆی سەرەتایی کە لـە ئەشـکەوتانی ئوروپـا و ئاسیای ناوەندیدا ژیـاوە، ئـامرازی زۆر سـاکاری هەبووە و ئـاوری ناسیوە و وێـدەچێ ئایینیشـی هەبووبێ.

**نئوپــان** / ne'opān/: [فرانسـوی]/اسـم. نیئۆپـان؛ تەختــەی دەســکرد لــە پووکــە، ئاردەمشــار و پۆخلەواتی چڵوچێو بە چەسپەوە.

**نئودیمیم** / ne'odîmiyom/: [انگلیسـی/ فرانسـوی] /اسم. نیئۆدیمیۆم؛ توخمێکی کیمیـایی کـانزا لـە دەستەی لانتانیدەکان بـە ژمـارە ئـەتۆمی ٦٠ و کێشی ئەتۆمی ١٤٤,٢٤ و ڕەنگی زەردەوە کە لە دروستکردنی جام و شووشەدا بە کار دێت.

**نئوزوئیک** / ne'ozoîk/: [فرانسوی] ☜ **نوزیوی**

**نئوژن** / ne'ojen/: [فرانسوی] ☜ **نوزا**

**نئوکلاسـیک** / ne'ok(e)lāsîk/: [فرانسـوی] ☜ **نوکلاسیک**

**نئولیتیک** / ne'olîtîk/: [فرانسوی] ☜ **نوسنگی**

**نئون** / ne'on/: [فرانسوی]/اسم. نیئۆن: ١. توخمی شیمیایی لـە دەسـتەی گازگـەلی نـەجیب، بـە ژمارەی ئـەتۆمی ١٠ و کێشـی ئـەتۆمی ٢٠,١٧، بێڕەنگ و بۆن، کە بە ڕێـژەی کـەم لـە هـەوادا هەیە ٢. لامپ نئون ☜ **لامپ**

**نبات** / nabāt/: [عربـی]/اسـم. ١. نـەوات؛ نـەبات؛ ماکێکی بلۆرینی شیرین و ڕەق، کە لە کوڵانـدن و ساردکردنەوەی شـیلەی قـەن بەرهـەم دێ و دەخورێت ٢. ـهـا؛ ـات/ ڕوەک؛ شـیناهی؛ گیـا؛ گیواو؛ گیوا؛ هەرچی لە زەوی شین دەبێ.

**نبــاتداغ** / nabātdāq/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. نەبات/ نەواتداخ؛ شـەربەتی نـەواتی تـوواوە لـە ئاوەکولدا ‹کمی نبات‌داغ بخور حالت بهتـر مـی‌شـود: هێندێک نەوات‌داخ بخۆ، باشتر دەبی›.

**نباتی**[1] / nabātî/: [عربی]/اسم. نەواتی؛ سپیـمـات؛ ڕەنگی زەردی بریکەداری مەیلەو سپی.

**نباتی**[2]: صفت. نەواتی: ١. گیایی؛ ڕوەکی ‹روغن نباتی: ڕۆن نەواتی› ٢. بە ڕەنگی نەواتی.

**نباختن** / nabāxtan/ ☜ **باختن**

**نباراندن** / nabārāndan/ ☜ **باراندن**

**نباریدن** / nabārîdan/ ☜ **باریدن**

**نبافتن** / nabāftan/ ☜ **بافتن**

**نبالیدن** / nabālîdan/ ☜ **بالیدن**

**نبایســتی** / nabāyestî/: قیـد. نـەدەبوو؛ نەئـەبوو؛ نەئـەبوا؛ نەمەشـیا؛ ناویـا؛ نەئـەویا؛ جـوان یـان پێویست نەبوو ‹نبایستی این کار را می‌کردی: نەدەبوو

ئەم کارەت کردبا›.

**نبخشودن** / nabaxšûdan/ ☜ **بخشودن**

**نبخشیدن** / nabaxšîdan/ ☜ **بخشیدن**

**نبرد** / nabard ، ـها/: اسم. [ادبی] شەڕ: ۱. سواژ؛ سواش؛ جەنگ؛ شەڕ و پێکدادان لە کات و شوێنێکی دیاریکراودا ‹نبرد استالینگراد: شەڕی ستالینگراد› ۲. خەبات؛ ملە؛ هۆملکێ؛ ململانێ.

◙ نبرد تن به تن: شەڕی دەستەویەخە؛ شەڕ و پێکدادان لە نزیکەوە.

**نبردن** / nabordan/ ☜ **بردن**

**نبریدن** / naborîdan/ ☜ **بریدن**

**نبستن** / nabastan/ ☜ **بستن**

**نبش** / nabš/: اسم. ۱. /ـها/ ڕۆقن؛ نەبش؛ سووچی پێک‌گەیشتنی دوو ڕووبەر ‹نبش پنجره: ڕۆقنی پەنجەرە› ۲. /ـها/ سیلە؛ ویرنج؛ قوماچ؛ دچ؛ سووچ؛ ئانیشکە؛ ئەو بەشە لە دیوار کە کەوتۆتە سەری شەقام یان کۆڵانەوە ‹نبش کوچه: سیلەی کۆڵان› ۳. [عربی] کاری دانەوە؛ هەڵکەندنەوە؛ هلکەواشتن؛ هلکەوشاندن؛ هەلکۆڵین ‹نبش قبر: دانەوەی گۆڕ›.

◙ نبش قبر: دانەوەی گۆڕ؛ گۆڕ هەلکۆڵین؛ هەڵکەندنەوەی قەبر.

**نبشی**[1] / nabšî ، ـها/: اسم. نەبشی؛ نەفشی؛ پارچە کانزای دووپاڵووی درێژ و ناسک کە بە سووچی ۹۰° داڕێژراوە.

**نبشی**[2]: صفت. [گفتاری] نەبشی؛ ڕۆقنی؛ لە سەر نەبش.

**نبض** / nabz/: [عربی] اسم. شوار؛ شوارۆ؛ پت؛ چڵ؛ کوتە؛ چرف؛ فرت؛ پل؛ پرتە؛ نەبز؛ تریوە؛ کۆلیل؛ لێدانی ڕەگی سووری لەش کە بە هۆی کرژ بوونەوەی ماسوولکەی دڵ بەدی دێت.

◙ نبض کسی در دست دیگری بودن: [مجازی] ڕەگی کەسێ لە دەستی کەسێکی‌تردا بوون؛ شارەزار بوون بە سەر حەز و خواستی کەسێکدا ‹نبض او در دست آزاد است، هر کار بگوید می‌کند: ڕەگی لە دەستی ئازاددایە، هەر چی بێژێ دەیکا›.

نبض گرفتن: شوار/ پت/ چڵ/ پرتە گرتن؛ شوارۆی ڕەگ ژماردن.

**نبض‌سنج** / nabzsanc ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. [پزشکی] شواربژێر؛ تریوەپێو؛ ئامرازێک بۆ ژماردنی پتی سوورەدەمار.

**نبض‌نما** / nabznemā ، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. [پزشکی] شوارنوێن؛ ئامێرێک بۆ شاندانی پتەکانی دڵ بە شێوەی شەپۆلی لەسەریەک.

**نبلعیدن** / nabal'îdan/: [فارسی/ عربی/ فارسی] ☜ **بلعیدن**

**نبوئیدن** / nabû'îdan/ ☜ **نبوییدن**

**نبوت** / nobovvat, nabovvat/: [عربی] اسم. [ادبی] پێغەمبەری؛ پەیغەمەری؛ پەیغەمبەری.

**نبود** / nabûd/: اسم. نەبی؛ نست؛ نستی؛ وێخ؛ ویخی؛ دۆخی نەبوون؛ نەبوونی؛ نەبیەی ‹اینها همه از نبود پول است: ئەمانە هەموو لە نەبوونی پارەیە›.

**نبودن** / nabûdan/ ☜ **بودن**

**نبوسیدن** / nabûsîdan/ ☜ **بوسیدن**

**نبوغ** / nobûq, nubûq/: [عربی] اسم. بلیمەتی؛ هەلکەوتەیی؛ لێهاتوویەکی ناوازە و داهێنەرانە کە لە بلیمەتاندا دەبینرێت.

**نبوی** / nabavî/: [عربی] اسم. [ادبی] پێغەمبەری؛ پەیغەمەری؛ پێوەندیدار بە پێغەمبەرەوە.

**نبوییدن** / nabûyîdan/ ☜ **بوییدن: نبوئیدن**

**نبی** / nabî ، انبیا/: [عربی] اسم. [ادبی] نەبی؛ پەیغەمبەر؛ پێغەمبەر.

**نبیختن** / nabîxtan/ ☜ **بیختن**

**نبیره** / nabîre ، ـها/ اسم. نەوەی چرک؛ نەوەزازا؛ نەڤیچر؛ نەڤیچر؛ نەڤی‌چرک؛ پاش‌وەچە؛ منالی منالی نەوە؛ پشتی چوارەم.

**نپائیدن** / napā'îdan/ ☜ **پاییدن**

**نپاشاندن** / napāšāndan/ ☜ **پاشاندن**

**نپاشیدن** / napāšîdan/ ☜ **پاشیدن**
**نپالودن** / napālûdan/ ☜ **پالودن**
**نپانتس** / nepāntes ، ـها/: [؟]/اسم. گیامەسینە؛ ڕوەکی کیسەداری گۆشتخۆر لە تیرەی میرووخۆران، تایبەتی ناوچەی گەرم و شێدار بە گەلای پان و بێدووچکەوە.
**نپاییدن** / napāyîdan/ ☜ **پاییدن: نپائیدن**
**نپتون** / nepton/: [فرانسوی]/اسم.[نجوم] نیپتۆن؛ گەڕۆکێکی خولگەی هەتاویە لە نێوان ئورانووس و پلوتۆ (پلوتۆن)دا.
**نپتونیم** / neptonyom/: [فرانسوی]/اسم. نیپتونیۆم؛ توخمی کیمیایی کانزایی ڕادیۆئەکتیڤ لە دەستەی ئاکتینیدەکان، بە ژمارەی ئەتۆمی ٩٣ و کێشی ئەتۆمی ٢٣٧,٠٤ و ڕەنگی زیوی بریقەدارەوە کە بە دەسکرد و لە ڕەوتی بەرهەم هێنانی پلۆتۆنیۆمدا بەرهەم دێت.
**نپختن** / napoxtan/ ☜ **پختن**
**نپخته** / napoxte/ صفت. کاڵ؛ خاو؛ خام: ١. نەکوڵاو؛ نەگریا ٢. [مجازی] بێتام؛ نابەجێ ‹حرفهای نپخته: قسەی بێتام› ٣. [مجازی] بێئەزموون؛ چاونەکراوە؛ کرچوکاڵ؛ دنیانەدیو؛ کەمزان ‹جوان نپخته: لاوی کاڵ›.
**نپذیرفتن** / napazîroftan/ ☜ **پذیرفتن**
**نپراکندن** / naparākandan/ ☜ **پراکندن**
**نپراندن** / naparāndan/ ☜ **پراندن**
**نپرداختن** / napardāxtan/ ☜ **پرداختن**
**نپرسیدن** / naporsîdan/ ☜ **پرسیدن**
**نپرستیدن** / naparastîdan/ ☜ **پرستیدن**
**نپروراندن** / naparvarāndan/ ☜ **پروراندن**
**نپروردن** / naparvardan/ ☜ **پروراندن**
**نپریدن** / naparîdan/ ☜ **پریدن**
**نپز** / napaz/: صفت.[گفتاری] دیرکوڵ؛ نەکوڵ؛ نەشیاو بۆ کوڵاندن ‹گوشت نپز: گۆشتی دیرکوڵ›.
**نپژمردن** / napajmordan/ ☜ **پژمردن**
**نپوئیدن** / napû'îdan/ ☜ **نپوییدن**
**نپوشیدن** / napûšîdan/ ☜ **پوشیدن**
**نپوکاندن** / napûkāndan/ ☜ **پوکاندن**
**نپوییدن** / napûyîdan/ ☜ **پوییدن: نپوئیدن**
**نپیچاندن** / napîčāndan/ ☜ **پیچاندن**
**نپیچیدن** / napîčîdan/ ☜ **پیچیدن**
**نپیراستن** / napîrāstan/ ☜ **پیراستن**
**نپیمودن** / napeymûdan/ ☜ **پیمودن**
**نپیوستن** / napeyvastan/ ☜ **پیوستن**
**نت** / not ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. نۆت؛ نوت: ١. ئەلفوبێتکەی مووسیقا ٢. مووسیقی نووسراو ٣. [نامتداول] یاداشت ٤. کورتەیاداشت لە کتێب یان وتار * **نوت**
**نتاباندن** / natābāndan/ ☜ **تاباندن**
**نتابیدن** / natābîdan/ ☜ **تابیدن**
**نتاختن** / natāxtan/ ☜ **تاختن**
**نتاراندن** / natārāndan/ ☜ **تاراندن**
**نتازاندن** / natāzāndan/ ☜ **تازاندن**
**نتایج** / natāyec/: [عربی] جمعِ ☜ **نتیجه**
**نپسندیدن** / napasandîdan/ ☜ **پسندیدن**
**نتپیدن** / natapîdan/ ☜ **تپیدن**
**نتخوانی** / notxānî/: [فرانسوی/ فارسی]/اسم. نوتخوێنی: ١. توانای ناسینی خەتی مووسیقا، نێوی نوتەکان و ڕادەی دەنگدانەوەیان ٢. توانای خوێندن یان ژەندنی ئامرازی مووسیقا لە ڕووی نوتەوە.
**نتراشیدن** / natarāšîdan/ ☜ **تراشیدن**
**نتراشیده** / natarāšîde/ صفت. ١. [گفتاری] نەپۆڕ؛ نابار؛ بەوقەلافەت؛ بەوڕێخت؛ بەدوخت ‹هیکل نتراشیده: پەیکەری نەپوڕ› ٢. نەتاشراو؛ نەتاشیاگ؛ نەتاشیا ‹ریش نتراشیده: ڕیشی نەتاشراو›.
**نتراویدن** / natarāvîdan/ ☜ **تراویدن**
**نتربوق** / natarbûq ، ـها/: اسم.[گفتاری] دەڵە؛ خوێڕی؛ خۆڕی؛ وێڵ؛ وێڵەکی؛ خۆڕی ــ تۆڕی؛ گەجەر ــ گوجەر؛ لاتی ــ پاتی؛ پەلەشت؛ قەلاش؛ مرۆی بێکارە و هیچکە و پووچکە: **نطربوق**

**نترس** / natars ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* ئازا؛ نەترس؛ ئازا؛ هەوێرا؛ وێرا؛ بوێر؛ دەمسوور؛ هـۆل؛ هـۆول؛ چـەلاق؛ دڵنەلـەخش؛ بـەغیرەت؛ چاوقـایم؛ چاوتوند؛ گەڕناس؛ دلێـر ‹خیلی نترس است: زۆر ئازایە›.

**نترساندن** / natarsāndan/ ☜ **ترساندن**

**نترسیدن** / natarsîdan/ ☜ **ترسیدن**

**نترشاندن** / natoršāndan/ ☜ **ترشاندن**

**نترشیدن** / natoršîdan/ ☜ **ترشیدن**

**نترکاندن** / natarakāndan/ ☜ **ترکاندن**

**نترکیدن** / natarakîdan/ ☜ **ترکیدن**

**نتق** / notoq/: [از عربی] ☜ **نُطُق**

**نتکانـــــدن** / natakāndan, natekāndan/ ☜ **تکاندن**

**نت‌نویسی** / notnevîsî/: [فرانسوی/ فارسـی] *اسـم.* نـوت‌نووسـی؛ نـوت‌نڤیسـی؛ کـاری نووسـینی مووسیقایەک بە خەتی نۆت.

**نتیدن** / natanîdan/ ☜ **تنیدن**

**نتوانستن** / natavānestan/ ☜ **توانستن**

**نتوپیدن** / natûpîdan/ ☜ **توپیدن**

**نتیجتا** / natîcatan/: [عربی] *قیـد.* لـە ئاکامـدا؛ دە ئاکامدا؛ لە ئاکاما؛ سۆخین؛ لە هافلدا ‹نتیجتا قرار شد به همه اطلاع دهیم: لـە ئاکامـدا بـڕیار درا بـە هەمووان ڕاگەیەنین›.

**نتیجه** / natîce ، ـها؛ نتایج/: [عربی] *اسم.* ۱. بـەهرە؛ ئاکام؛ دۆنگی؛ سۆخی؛ هافل؛ نەتیجە؛ سەرەنجە؛ بەرهەم یان قازانجی کارێـک ‹مسـافرت بـە اروپـا نتیجه‌ای نداشت: سەفەر بۆ ئورووپا بەهرەیەکی نەبوو› ۲. ئاکام؛ ئەنجام؛ شـوێنهاتی کـار یـان ڕەوتێـک ‹نتیجه‌ی تلاشهایم آن شد کـه آشـتی کردنـد: ئاکـامی تەقالام بـوو بـەوە ئاشـتیان کـردەوە› ۳. نەتیجـە؛ نەوەزا؛ منالی نەوە؛ پشتی سێهەم.

**نتیجه‌بخش** / natîcebaxš/: [عربی/ فارسی] *صفت.* بەبەهرە؛ بەهرەدەر؛ بەهرەدار؛ ئاکامدار؛ بە ئاکام ‹تلاشش نتیجه‌بخش بود: هەوڵەکەی بەبەهرە بوو›.

**نتیجه‌گیری** / natîcegîrî ، ـها/: [عربـی/ فارسـی] *اسم.* دەسکەوت؛ کار و ڕەوتی بۆچوون؛ لێکدانەوە ‹نتیجه‌گیری شما از این بحث چیست؟: دەسکەوتـی ئێوە لەم باسە چیە؟›.

**نثار** / nesār/: [عربـی] *اسـم.* ۱. *[مجازی]* بـەخت؛ قوربان؛ فیـدا ‹جـان و مـال خـود را در ایـن راه نثـار می‌کنیم: لەم ڕێگایەدا گیان و مالـی خۆمـان بـەخت ئەکـەین› ۲. پایـەناز؛ کـار و ڕەوتی پێشـکەش کردن؛ ئاراستەکردن هـاوڕێ لەگـەڵ داخسـتن یان دانان.

▣ **نثـار کسـی کـردن**: *[گفتـاری]* بـە کەسـێکدا سەکاندن؛ کەسێک بەر جنێو دان ‹تـا خواسـت حرف بزند، چهارتا نثارش کرد: هەر هات قسـە بکـا، چواری پێدا سەکاند›.

**نثـر** / nasr ، ـهـا/: [عربـی] *اسـم.* نەسـر؛ وێژامـە؛ وەژەگ: ۱. زمانی خەڵکی ئاسایی لە قسەکردن و نووسیندا ۲. پەخشان؛ نڤیسـکی؛ نووسـراوەی بەبێ کێش و ئاهەنگ و باقی تایبەتمەندیـەکانی شیعر.

**نجابـت** / necābat, nacābat/: [عربـی] *اسـم.* ۱. نەجیبی؛ نەجیوی؛ ئاکارباشی؛ بـار و دۆخـی ئاکارچاک بوون ‹نجابت کـرد و نگذاشـت بـە زنـدان بیفتـی: نـەجیبی کـرد و نەیهێشـت بکەویتـە بەندیخانەوە› ۲. پاکی؛ داوێن‌پاکی؛ چاوپاکی.

**نجـات** / necāt, nacāt/: [عربـی] *اسم.* نـەجات؛ نجات؛ ڕزگاری؛ ڕەهایی؛ کار و ڕەوتی پەڕینەوە؛ دەرباز بوون؛ خەلەستین.

▣ **نجات پیدا کردن** ☜ **نجات یافتن**

**نجات دادن**: پەڕاندنـەوە؛ پەڕانـەوە؛ نـەجات دان؛ نجـات دای؛ ئەوەپڕنـەی؛ ڕزگـارکردن؛ خەلساندن؛ لادایِن.

**نجات یافتن**: ڕزگار بوون؛ دەرچوون؛ خەلستن؛ ڕەها بوون؛ دەربـاز بـوون؛ پەڕینـەوە؛ فلـتین؛ نەجات بوون؛ نجات بیەی؛ پڕایوە ‹همه از غرق شدن، نجات یافتند: هەموو لە خنکان ڕزگار بوون›؛

**نجات پیدا کردن**

**به نجات کسی شتافتن:** بە هانای کەسێکەوە چوون؛ چوونە هانای کەسێکەوە؛ وە فریای کەسێ کەوتن ‹دوستانش بە نجات او شتافتند: هەڤاڵەکانی بە هانایەوە چوون›.

**نجات‌بخش** / necātbaxš, nacāt- /: [عربی/ فارسی] صفت. ڕزگارکەر؛ نەجاتدەر؛ دەربازکەر.

**نجات‌غریق** / necātqarîq, nacāt- ، ـها/: [عربی] /اسم. مەلەوانێ کە وریای مەلەکەرانە و ناهێڵێ بخنکن.

**نجار** / naccār ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. دارتاش؛ مەرەنگۆز؛ نەجار؛ سنعەتکاری کەلوپەلی دارینە.

**نجاری** / naccārî/: [عربی]/اسم. دارتاشی؛ مەرەنگۆزەی؛ نەجاری: ۱. کار و ڕەوتی ئامراز چێکرن لە چێو ۲. کاری دارتاش ۳. /ـها/ کارگەی دارتاش.

**نجاسات** / necāsāt, nacāsāt/: [عربی] جمعِ ☜ **نجاست**

**نجاست** / necāsat, nacāsat ، ـها؛ نجاسات/: [عربی]/اسم. پیسی؛ ناپاکی؛ چەپەڵی: ۱. *[اسلام]* ئەوەی بە قانوونی شەرع ناپاک ئەژمێردرێ ۲. *[گفتاری]* پۆخڵەوات؛ شتی پیس و ناپاک.

**نجبا** / nocabā/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* نەجیوان؛ نەجیبان؛ نەجیبگەل؛ نەجیبێ؛ خەڵکی ناسراو و گەورەی کۆمەڵگا، بەتایبەت ئەوانەی کە باب و باپیرانیشیان ناو و ناوبانگیان بووە.

**نجس** / naces ، ـها/: [عربی] صفت. ۱. *[اسلام]* سپڵۆت؛ سپڵۆک؛ سپڵۆتی؛ تایبەتمەندی ئەو شتەی کە بە پێی شەرع ناپاکە یان پاکی هەڵناگری یا دەبێ پاک بێتەوە ۲. سەنم؛ تەرێف؛ گەمار؛ کۆتی؛ ناپاک؛ پیس؛ گڵاو.

**نجستن** / nacastan, nacestan/ ☜ **جَستن**

**نجستن** / nacostan/ ☜ **جُستن**

**نجسی** / nacesî ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. پیسی؛ ناپاکی؛ چەپەڵی؛ سپڵۆتی ۲. *[گفتاری]* خواردنەوەی ئەلکولی.

**نجم** / nacm ، انجم/: [عربی] ☜ **ستاره ۱ و۲**

**نجنباندن** / nacombāndan, naconbāndan/ ☜ **جُنباندن**

**نجنبیدن** / nacombîdan, naconbîdan/ ☜ **جنبیدن**

**نجنگیدن** / nacangîdan/ ☜ **جنگیدن**

**نجوا** / nacvā ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. سرپە؛ سرتە؛ سرکە؛ چپە؛ چرپە؛ چفە؛ چڤە؛ پچە؛ پسکە؛ نـچ؛ پخ؛ قسەی لە بن گوێ بۆ ئەوەی کەسی‌تر گوێ لێ نەبێ ۲. ورە؛ ورتە؛ دەنگی نزم.

▣ **نجوا کردن:** سرپەکردن؛ پچەکردن؛ چپە کردن؛ سرتەسرت‌کردن؛ پخ‌کردن؛ بە هێواشیەوە قسەکردن.

**نجوش** / nacûš/: صفت. *[مجازی، گفتاری]* نەبان؛ سارد و سڕ؛ تایبەتمەندی ئەو کەسەی لە خەڵک هەڵدێ و هات‌وچۆیان ناکا ‹این برادر تو خیلی نجوش است: ئەم برایەت زۆر نەبانە›.

**نجوشاندن** / nacûšāndan/ ☜ **جوشاندن**

**نجوشیدن** / nacûšîdan/ ☜ **جوشیدن**

**نجوم** / nucûm, nocûm/: [عربی]/اسم. ئەستێرەناسی؛ هەسارەناسی.

**نجومی** / nucûmî, nocûmî/: [عربی] صفت. ۱. ئەستێرەناسی ‹تحقیقات نجومی: توێژینەوەی ئەستێرەناسی› ۲. *[مجازی]* سەر لە ئاسمان؛ یەکجار زۆر ‹رقمهای نجومی: ژمارەی سەر لە ئاسمان›.

**نجویدن** / nacavîdan/ ☜ **جویدن**

**نجهاندن** / nacahāndan/ ☜ **جهاندن**

**نجهیدن** / nacahîdan/ ☜ **جهیدن**

**نجیب** / nacîb/: [عربی] صفت. ۱. نەجیب؛ ئاکارباش ۲. ڕەسەن؛ جسن؛ وجاخ‌ئەسڵ؛ بنیچە بەڕێز و گەورە ۳. کەحێل؛ کەحلان؛ ئادەر؛ تایبەتمەندی ئەسپ یان وشتری چاک

٤. داوێن پاک؛ چاوپاک؛ پاکداوێن؛ پاکداو ‹زن نجیب: ژنی داوێن پاک› ٥. ☜ گاز نجیب، **گاز**

**نجیب‌خانه** / nacîbxāne ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم. [تعریض]* قەحبەخانە؛ جندەخانە.

**نجیب‌زاده** / nacîbzāde ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* خانەدان؛ ڕەهیشتە؛ هیلاد؛ پسمیران؛ نەجیب‌زادە؛ بنیچەئەسڵ.

**نچ** / noč/: *صوت.* ١. نەء؛ نە؛ چ؛ چن؛ چۆ؛ نا؛ قەد؛ قەت؛ نیشانەی ڕەدکردنەوەی شتێک ‹نچ، نمی‌آیم: نەء، نایەم› ٢. چن‌ـچن؛ حەی‌حەی؛ هەی‌هەی؛ وەی‌وەی؛ نیشانەی داخ و کەسەر ‹نچ ـ نچ! چکار کردی؟: چن ـ چن! چیت کرد؟›.

**نچاپیدن** / načāpîdan/: [فارسی/ ترکی/ فارسی] ☜ **چاپیدن**

**نچاییدن** / načāyîdan/ ☜ **چاییدن**

**نچپاندن** / načapāndan/ ☜ **چپاندن**

**نچپیدن** / načapîdan/ ☜ **چپیدن**

**نچراندن** / načarāndan/ ☜ **چراندن**

**نچرخاندن** / načarxāndan/ ☜ **چرخاندن**

**نچرخیدن** / načarxîdan/ ☜ **چرخیدن**

**نچریدن** / načarîdan/ ☜ **چریدن**

**نچزاندن** / načezāndan/ ☜ **چزاندن**

**نچسب** / načasb ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* ١. نەچەسب؛ بێ‌تایبەتمەندی چەسپین ٢. *[مجازی]* ناحەز؛ دڵنەخواز؛ دڵنەویس؛ گۆشتاڵ؛ کرێت؛ درێو؛ بەئۆک؛ ڕەزاتاڵ؛ ڕەزاگران؛ ئێسک‌قورس.

**نچسباندن** / načasbāndan/ ☜ **چسباندن**

**نچسبیدن** / načasbîdan/ ☜ **چسبیدن**

**نچسیدن** / načosîdan/ ☜ **چسیدن**

**نچشاندن** / načešāndan, načašāndan/ ☜ **چشاندن**

**نچشیدن** / načešāndan, načašîdan/ ☜ **چشیدن**

**نچکاندن** / načekāndan, načakāndan/ ☜ **چکاندن**

**نچکیدن** / načekîdan, načakîdan/ ☜ **چکیدن**

**نچلاندن** / načelāndan/ ☜ **چلاندن**

**نچیدن** / načîdan/ ☜ **چیدن**

**نحس** / nahs/: [عربی] *صفت.* ١. بەدودم؛ بەوودم؛ قۆشە؛ جووت‌قۆشە؛ قۆشمە؛ دوموهر؛ شووم؛ کابرەش؛ کەفارەتی؛ قەش؛ قەشقە؛ قدۆش؛ سمسک؛ گۆتاڵ؛ گوناتە؛ گەرجە؛ سەرکرنیک؛ نامبارەک؛ پێ‌ڕەش؛ تاڵە؛ نەحس؛ نێس؛ نوورپەڕی؛ قەدەمشەڕ؛ نەفەس‌پیس ‹فکر می‌کردند ١٣ نحس است: وایان دەزانی ١٣ بەدودمە› ٢. *[مجازی، گفتاری]* میزن؛ نووزن؛ گرۆز؛ گرووگر؛ نائارام؛ بێ‌قەرار (بۆ منداڵ دەگوترێ) ٣. *[گفتاری]* خراپ؛ ناجۆر؛ ئازاردەر.

**نحسی** / nahsî/: [عربی] *اسم.* ١. بەدودمی؛ بەوودمی؛ قۆشەیی؛ شوومی ٢. *ـها/ [مجازی، گفتاری]* نائارامی؛ نووزنی؛ میزنی؛ بیانووگری ٣. *[گفتاری]* خراپی؛ ناجۆری؛ ئازاردەری.

**نحو** / nahv/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ١. / انحا/ شێوە؛ ڕەوشت؛ جۆر؛ شێواز؛ تەرز؛ چەشن ‹این نحو کار کردن، تو را به جایی نمی‌رساند: ئەم شێوە کار کردنە ناتگەیێنێتە هیچ‌کوێ› ٢. شێوەی تێکەڵ بوونی وشە بۆ دروست‌کردنی ڕستە یان سارستەیەک ٣. بەشێکی ڕێزمان لەم بابەتەوە.

▣ **به نحو احسن**: بە باشترین شێوە/ جۆر؛ بە باشی؛ بە خاسی؛ بە خاسترین/ چاکترین شێواز ‹او کارش را به نحو احسن انجام داد: کارەکەی بە باشترین شیوە جێبەجێ کرد›.

**نحوست** / nohûsat, nuhûsat ، ـها/: [عربی] *اسم.* بەدودمی؛ قۆشەیی؛ قۆشمەیی؛ شوومی؛ نامبارەکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی قۆشە بوون.

**نحوه** / nahve ، ـها؛ انحا/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ١. چۆنیەتی؛ چۆناوچۆنی ‹نحوەی ملاقات با رئیس: چۆنیەتی چوونە لای سەرۆک› ٢. شێواز؛ شێوە؛ ڕەوشت؛ جۆر؛ چەشن؛ تەرز؛ هۆل ‹نحوەی پختن

غذا: شیوەی چێشت لێنان›.

**نحـوی**[1] / nahvî ، ـها؛ ـان؛ ـون/: [اعربـی]/اسـم. [قدیمی] زمانەوان؛ ڕێزمانزان؛ مامۆستای ڕێزمان.

**نحـــوی**[2]: صـفت. ڕێزمـــانی ‹ویژگیهـــای نحـــوی: تایبەتمەندیە ڕیزمانیەکان›.

**نحیف** / nahîf/: [اعربی] صفت. [ادبی] کز؛ لەڕ؛ نزار؛ لاواز؛ لەغەر؛ لەجەر؛ باریک؛ چـەلقوو؛ چەکلـەر؛ لەڕ و لاواز ‹بدن نحیف: لەشی کز›.

**نـخ** / nax ، ـهـا/: اسـم. ۱. دەزوو؛ دەزو؛ دەزگ؛ دەزی؛ لۆنە؛ دەسک؛ دەشکی؛ دەسکە؛ مـەچیر؛ بەن؛ نەی؛ ئافشووژن؛ هەودای باریکی لە پەموو، خـوری یـان مـاکی دەسـکرد ڕێسـراو ۲. دانـە؛ یەکەی بژاردنی جگـەرە ‹یـک نـخ سیگار خریـد: دانەیەک جگەرەی کڕی›.

▣ **نخ پرک**: بەن‌قەن؛ بەنێکی قایم و پتەو کە لە بادانی چەن تاڵـە هـەودای ئاسـایی دروسـت بووە: **نخ قند**

**نخ قرقره**: کندر؛ کەندر؛ کندێلە؛ کنر؛ دەزووی قرقرە؛ بەنێ کە لە سەر مەکارە هەڵکراوە.

**نخ قند** ☜ **نخ پَرک**

**نخ کاموا** ☜ **کاموا**

**نخ کوک**: فرێت؛ بەن کۆک؛ بەنێکی هێندێک ئەستوور و نـەرم کـە کـرژ نەکراوەتـەوە و بـۆ کۆک‌کردن بە کار دەڕوا.

▣ **نخ دادن**: کێش‌هاتن؛ دەزوولە کردن؛ ڕینـگ پێکەی؛ ڕێسکەرە کێشتەی ‹وەک کێش هاتنی هەنگوین و شیلە›.

**نخ کردن**: بـەن (پێـوە)کـردن؛ کـەردەپۆنـەی ‹سوزن را نخ کردن: بەن بە دەرزیەوە کردن›.

**از نخ گذراندن**: بە بەنـەوکردن؛ هەڵـبگاردن؛ هەڵـبگێڕاندن؛ هەڵـبگێڕان؛ پێکنـایەوە؛ بـە فرێتەوکردن؛ بەن بە شتێکەوە کردن ‹انجیرهـا را یکی ـ یکـی از نـخ مـی‌گذرانـد: هـەنجیرەکانی یەکە-یەکە بە بەنەو دەکرد›.

**به نخ کشیدن**: کردنە بەنەوە؛ بەن تـێ‌کێشـان؛ بەن پێوەکردن؛ بەن کێشانە ناو چەن شت و لە ڕیزی یەک بەستنیان ‹دانەهای تسبیح را بـە نخ کشید: تەسبێحەکانی کردە بەنەوە›.

**تو(ی) نخ کسی/ چیزی رفتن**: [مجازی] مـاقی کەسێ/ شتێک بوونەوە؛ چوونە ناخی کەسـێ/ شتێکەوە؛ وردەوە بوون لـە کەسـێ/ شـتێک؛ سەرنج دانی زۆر ‹رفته بود توی نخ مورچه کـه بـا حوصله کار می‌کرد: ماقی میرووله‌که ببووە کـە بـە تاقەتەوە کاری دەکرد›.

**نخاب** / naxāb ، ـها/: اسم. میزاو؛ مێزاو؛ گمێزئاو؛ میزاڤ؛ نمورئاو؛ باریکەئاو؛ باریکاو؛ ئاوی زۆر کەم کە لە سەرچاوەوە یان بەجۆگەدا دێ.

**نخاراندن** / naxārāndan/ ☜ **خاراندن**

**نخاریدن** / naxārîdan/ ☜ **خاریدن**

**نخاع** / noxā'/: [اعربی] اسم. مرۆخە؛ مۆخ؛ کرۆک؛ کرۆکی بڕبـڕە؛ بەشـێک لـە کۆنـدامی ناوەنـدی دەمار کە وەک تـەنافێک لـە نێـو بڕبڕاگەدایـە: **نخاع شوکی**

▣ **نخاع شوکی** ☜ **نخاع**

**نخـــاعی** / noxā'î/: [اعربـــی] صـــفت. مـــۆخی؛ مرۆخەیی؛ سەر بە موخ.

**نخالـــه**[1] / noxāle ، ـهـــا/: [اعربـــی] اسـم. زبـرە: ۱. گەپەک؛ کەپەک؛ کۆزەر؛ کـوێزەر؛ کـۆزەرە؛ قرتیـل؛ چـەت؛ کۆتەڵـی خـەرمان ۳. [قـدیمی] سیڤۆی؛ سەربێژنگ؛ سەرکۆزەر؛ ئەشغاڵ؛ زربـە؛ ڕێخ؛ زروە؛ پژەر؛ پینە؛ سۆ؛ سڤی؛ سۆس؛ کرپک؛ کەلیک؛ کیرپک؛ سۆست؛ سۆسک؛ سەرهێڵەگ؛ پشـــی؛ درشـــتەی ســـەر هێلـــێک ۳. بەشـــی بـێ‌بایـەخی کـان کـە ماکـە بایەخدارەکـەی لێ‌دەرهاتووە و ماوەتەوە: **هرزەسنگ**

**نخاله**[2] / ـها/: صفت. [مجازی] ۱. ڕیخنە؛ ئەشـغال؛ هیچ و پووچ؛ ئاشـاخە؛ قرپـۆک؛ قرپـک؛ ئـەیاغ؛ سۆک ‹راننده خیلی نخاله بود: شۆفێرەکە زۆر ڕیخنـە بوو› ۲. [گفتاری] پووتەکە؛ نابار؛ ناکلۆکار.

**نخ بـازی** / naxbāzî/: اسم. بـەن‌بـازی؛ جـۆرێ

کایەی دوونەفەرەیە بەن لە قامکیانەوە دەپێچن و شکڵی پێ دەردێنن.

**نُخبه** / noxbe ، ـها؛ ـگان/: [عربی] *صفت.* پیتۆڵ؛ پیتۆر؛ بەهووردە؛ هەڵبژاردە؛ ناوازە.

**نخبه پـروری** / noxbeparvarî/: [عربی/ فارسی] */اسم.* زاناپەروەری: ۱. کار و ڕەوتی ڕاهێنان و پەروەردەکردنی مرۆی هەڵکەوتە و ناوازە ۲. سیستەمێکی پەروەردەیی کە لە سەر بنەمای بارهێنان و پەروەردەکردنی کەسانی هەڵکەوتە داڕێژراوە. بەرامبەر: **نخبه‌کشی**

**نخبه‌سالاری** / noxbesālārî/: [عربی/ فارسی] */اسم.* زاناسالاری؛ حکوومەت یان ڕێبەرایەتی کەسانی هەڵکەوتە.

**نخجل** / naxcal/ ☜ **نیشگون**

**نخجیر** / naxcîr ، ـها/: */اسم. [ادبی]* نەچیر؛ نێچیر؛ نچێر؛ نچیر؛ ڕاو؛ ڕاوشکار: ۱. گیانەوەرێ کە ڕاو دەکرێ ۲. ڕاوێ کە دە چیادا دەژی، بەتایبەت بزنە کێوی ۳. کارەڕەهاتی ڕاوکردن.

**نخجیربـان** / naxcîrbān ، ـان/: */اسم. [ادبی]* نەچیرەوان؛ نێچیروان؛ نچیرڤان؛ ڕاوچی.

**نخجیرگـاه** / naxcîrgāh ، ـها/: */اسم. [ادبی]* نەچیرگە؛ نێچیرگە؛ نچیرگە؛ ڕاوگە.

**نخـراز** / naxrāz/: */اسم.* سۆوری؛ سەرگەل؛ ڕەمکێش؛ نواکێش؛ پێشڕۆ؛ ساورێن؛ سابرێن؛ تەگە؛ تەجە؛ سەرجەلە؛ سەرگەلەی پەز و بزن؛ نێری پێشەنگ.

**نخراشیدن** / naxarāšîdan/ ☜ **خراشیدن**

**نخرامیدن** / naxarāmîdan/ ☜ **خرامیدن**

**نخروشـیدن** / naxurûšîdan, naxorûšîdan/ ☜ **خروشیدن**

**نخـری** / noxrî, naxrî/: */اسم. [قدیمی]* بەرەزا؛ نۆلەم؛ نخری؛ نوخوری؛ نۆزگ؛ نۆزکە؛ نۆزگە؛ نوسکە؛ نۆبەرە؛ نۆچەش؛ یەکەم فرزەند.

**نخریدن** / naxarîdan/ ☜ **خریدن**

**نخریس** / naxrîs ، ـها/: */اسم.* ۱. ـان/ بەنڕێس؛ تەشیڕێس؛ ڕێسیار؛ ئەوەی بەن دەڕێسێ ۲. *[جانورشناسی]* واڵەداو؛ قیتکەی بنسکی جاڵجاڵووکە کە تاڵەکانی لێوە دێنە دەر: **تارریس**

**نخریسی** / naxrîsî/: */اسم.* بەنڕێسی؛ فرێتڕێسی؛ کاری ڕێستنی بەن و فرێت.

**نخزیدن** / naxazîdan/ ☜ **خزیدن**

**نخسـت**[1] / naxost, noxost/: *صفت. [ادبی]* نۆ؛ نوخشە؛ یەکەم؛ هەوەڵ؛ ئەوەڵ ‹فرزند نخست: مندالی یەکەم›.

**نخست**[2]: *قید. [ادبی]* لە بەرا؛ لە هەوەڵەوە؛ لە سەرەتاوە؛ لە سەرەتادا؛ لە پێشدا؛ دە پێشدا؛ لە پێشەوە؛ وەڵێنە: ۱. پێش لە کەس یان کەسانیتر ‹نخست او آمد: لە بەرا ئەو هات› ۲. هەوەڵ جار؛ نوخشەجار ‹نخست می‌خواست زن بگیرد: لە پێشدا ئەیەویست ژن بخوازێ›.

**نخست‌زادگی** / naxostzādegî/: */اسم.* بەرەزایی؛ نۆبەرەیی؛ نۆلەمی؛ نۆزگی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نۆبەرە بوون.

**نخست‌زاده** / naxostzāde ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* بەرەزا؛ نۆبەرە؛ نۆلەم؛ نۆزگ؛ نۆزگە؛ نۆسکە؛ نخری؛ بە دنیا هاتوو پێش لە منالانیتر.

**نخست‌وزیر** / naxostvazîr, noxost- ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ معرب] */اسم.* سەرۆکوەزیر؛ سەرەکوەزیر؛ سەرۆکشالیار؛ سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لە هەندێ لە وڵاتاندا.

**نخستین** / naxostîn, noxostîn/: *صفت.* یەکەمین؛ هەوەڵین؛ یەکا؛ بەرین.

**نخشکاندن** / naxoškāndan/ ☜ **خشکاندن**

**نخشکیدن** / naxoškîdan/ ☜ **خشکیدن**

**نخفتن** / naxoftan/ ☜ **خفتن**

**نخل** / naxl ، ـها/: [عربی] */اسم.* نەخڵ؛ دار خورما.

**نخلستان** / naxlestān ، ـها/: [عربی/ فارسی] */اسم.* نەخڵستان؛ باخی دارە خورما.

**نخلیدن** / naxalîdan/ ☜ **خلیدن**

**نخماندن** / naxamāndan/ ☜ **خماندن**

**نخمیدن** / naxamîdan/ ☜ **خمیدن**

**نخنداندن** / naxandāndan/ ☜ **خنداندن**

**نخندیدن** / naxandîdan/ ☜ **خندیدن**

**نـــخ‌نمـــا** / naxnemā/: *صـفت.* ١. کەچەڵـــە؛ کەچەڵـــەداو؛ تایبەتمەنـــدی پارچـــە، جـــل و بەتایبەت فەرشێ کە لە بەر کۆنە بوون و کـاری زۆر، تان و پـۆی دەرکـەوتووە ‹یـک قـالی نـخ‌نمـا انداختـه بـود وسـط اتـاق: قالّـیەکی کەچەڵـەی لـە نێوەڕاستی دیوەکە ڕاخستبوو› ٢. کۆن و بێبایەخ.

▣ **نـخ‌نمـا شـدن:** ١. کەچەڵـە دان؛ وەریـن و نەمانی کولکە و تووکی چنراوە بە هۆی کۆنـە بوون و کاری زۆرەوە ٢. *[کنایی]* لە بار کـەوتن؛ بێ بایەخ بوون ‹این حرف‌ها دیگر نخ‌نما شـده‌انـد: ئەم قسانە چیتر لە بار کەوتوون›.

**نخوابیدن** / naxābîdan/ ☜ **خوابیدن**

**نخواستن** / naxāstan/ ☜ **خواستن**

**نخواندن** / naxāndan/ ☜ **خواندن**

**نخوانـده مـلا** / naxāndemollā ، ـهـا؛ ـیـان/: [فارسی/ از عربی] *صفت.* کۆلکەمـەلا؛ کۆڵـکەمەلا؛ زڕەمەلا؛ زرمەلا؛ نەزانی خۆ بەشت زان.

**نخـــوت** / naxvat, nexvat/: [عربـی] *اسـم. [ادبـی]* فیز؛ بەرزەدەماری؛ خۆهەڵکێشی؛ لووت‌بـەرزی؛ ئاکاری نیشانەی خۆ بە سەرتر لە دیتران زانین.

**نخود** / noxod ، ـها/: *اسم.* نـۆک: ١. ڕووەکێکـی یەک‌ساڵەیە بە گەڵای شانەیی کولکن و گوڵـی ئەرخەوانی تاک و میوەی خڕەوە ٢. نخە؛ نخـۆ؛ نوخۆ؛ نوخە؛ نها؛ نووخە؛ نوەی؛ نـەهک؛ نۆهـک؛ نوهـۆ؛ نـووک؛ هـۆک؛ دانی ئـەو گیایـە کـە دانەوێڵەیەکی پچـووکی بـە دندووکـە و بـۆ زۆر چێشتان دەبێ، هەروەها لە دەسـتاڕ دەکـرێ و نخۆشـەری لـێ بەرهـەم دێ ٣. پێوانەیـەکی کێشانەیە ئەوەندەی ٠,٢ گرەم.

▣ **نخود توی شلـه زرد:** *[کنـایی]* نابـەجێ؛ شـتی زیایی و بێجێ.

**نخـــود رســـمی:** نۆکـــەزەردی؛ نۆکـــەزەردە؛ زەردەنۆک؛ نخەزەرد؛ زەرنۆک.

**نخـــود سبز:** شـــوول؛ هـــولیرە؛ ولێـــرە؛ ولـــەرە؛ نۆکەمار؛ گـاگۆز؛ پۆلکەسـەوزە؛ نۆکەکەسـک؛ نۆکەسەوزە.

**نخود سیاه:** نۆکەڕەشـە؛ نۆکەڕەشـکە؛ نـۆکی ڕەش؛ نخەسیە؛ نویە سیاوێ؛ نەهـەی سـیا؛ جـۆرێ نـۆکی وردی زەردکـار کـە ڕەنگـی پێستەکەی ڕەشە.

**نخود فرنگی** ☜ **نخودفرنگی**

▣ **نخود هر آش شدن:** *[تعریض]* لـە نێـو هـەر کاسەیەکدا کەوچک بوون؛ قەڵەمەی ناو قلیە بـوون؛ نیسـکی هـەموو چێشـتێک بـوون؛ دەس‌تێوەردان و خۆتێ هەڵقولتان لە هەموو کارێکدا.

**دنبال نخود سیاه فرستادن** ☜ **دنبال**

**نخودچی** / noxodčî ، ـها/: [فارسی/ ترکی] *اسم.* لوبوبە؛ لەبلەبی؛ نۆکەقەنی؛ نخەبرشـیاگ؛ نۆکـە سپیلکەی لە شیردا کولاوی وشکەوەکراو.

**نخودفرنگی** / noxodfarangî ، ـها/: [فارسـی/ از فرانسـوی] *اسم.* شـۆقل؛ گـاگۆز؛ پولکـە؛ پۆڵـکە؛ کەشۆل: ١. گیایەکی ئـالیکی یـەک‌سـالان کـە بـەرێکی خڕیلانـە و سـەوز دەگـرێ ٢. نـۆکی کەسـک؛ بـەری ئـەو گیایـە کـە دانەوێڵـەیە و دەخورێ.

**نخـــودی**[1] / noxodî/: *اسـم.* ١. ئێسـکەخڕیلەی سەر مەچەک ٢. ڕەنگی زەردی مەیلەو قـاوەیی تا نارنجی مات ٣. *ـها/ [مجازی، گفتاری]* ڕێحانـە؛ ئـەوەی لـە کۆڕێکـدا هـەبێ بـەڵام بەشـداری سەرەکی نەکا (وەک مندالی ناوکایەی گەورە).

**نخودی**[2]: *صفت.* نۆکی: ١. سەر بە نـۆک ٢. بـە ڕەنگی زەردی مەیلەو قاوەیی یان نارنجی.

**نخـــور** / naxor/: *صـفت.* نــەخۆر؛ نــەخوەر: ١. کەم‌خۆر؛ خاوەن خوو یا مەیل بە نـەخواردن ٢. *[کنایی]* ڕژد؛ چکووس؛ نان‌کوور؛ نەتڵ.

**نخوراندن** / naxorāndan/ ☜ **خوراندن**

**نخورد** / naxord/: *اسم. [گفتاری]* نەخورد؛ نەخوارد؛ نەخواردن.

▣ **نخورد نداشتن**: ۱. هەڵە نەکردن؛ لا نەکەردەی؛ سەر نەکردن؛ ڕێک پێوەنان؛ خەتا نەکردن ‹تیرش نخورد نداشت: تیری هەڵەی نەدەکرد› ۲. *[مجازی]* بێشک بوون؛ بێقسە بوون؛ مسۆگەر بوون؛ حەتمای حەتم بوون ‹نخورد ندارد که برمی‌گردد: بێشکە دێتەوە›.

**نخوردن** / naxordan/ ☜ **خوردن**

**نخی** / naxî ، ـها/: *صفت.* بەنی: ۱. لە بەن ۲. لە هەودای پەمۆ ‹پارچەی نخی: قوماشی بەنی›.

**نخیر** / naxeyr/: [فارسی/ عربی] *قید. [گفتاری]* نە؛ نا؛ نەخێر؛ نەخەیر ‹نخیر، نمی‌شود: نەخێر، نابێ›.

**نخیساندن** / naxîsāndan/ ☜ **خیساندن**

**نخیسیدن** / naxîsîdan/ ☜ **خیسیدن**

**نخیل** / naxîl ، ـها/: [عربی] *اسم.* دار خورما، بەتایبەت نەمامی خورما.

**ـ ند** / and/: *ضمیر.* ـ ن؛ ـ ێ؛ جێناوی سێهەم کەسی کۆ لە کۆتایی کاردا ‹آمدند: هاتن› (تێبینی: لە زمانی فارسیدا ئەگەر کارێک ئاخری بە «آ» یان «وُ» بێتەوە، دەبێتە «یند» ‹می‌آیند؛ می‌گویند: دێن؛ دەڵێن/ ئێژن›، ئەگەریش بە «ه» نەگوتراو بێتەوە، دەبێتە «اَند» ‹خفته‌اند: خەوتوون›).

**ندا** / nedā/: [عربی] *اسم.* بانگ؛ دەنگ؛ دەنگە: ۱. *ـها/* گاز؛ گازی؛ گاڵ؛ قاو؛ کارێک بۆ بانگ کردن و ڕاکێشانی سەرنجی کەسێک ‹می‌خواستی به من ندا بدهی: با منت بانگ بکردایە› ۲. *[مجازی]* کاری بانگهێشتن ‹مردم به ندای وی پاسخ گفتند: خەڵک هاتنە دەنگیەوە› ۳. *[دستور]* وشەیەک بۆ بانگ لێکردن (وەک: ئەی).

▣ **ندا دادن**: ۱. خەبەر دان؛ هەواڵ دان ‹هر وقت رفتی ندا بده من هم بیایم: کاتێ ڕۆیشتی خەبەر بدە منیش بێم› ۲. هەراڵە کردن؛ جاڕ دان؛ بانگەواز کردن؛ دەنگ دای چەنە؛ هەرا کردن؛ گاز کردن.

**ندادن** / nadādan/ ☜ **دادن**

**ندار** / nadār ، ـها/: *صفت.* هەژار؛ نەدار؛ نسک؛ دەسکورت؛ کەمدەس؛ فەقیر؛ بێماڵ؛ ڕووتوقووت؛ دەس‌نەڕۆیو؛ بێپارە؛ بێزەڕ؛ مایەپووچ.

▣ **ندار بودن با کسی**: *[مجازی]* تێکەڵ بوون لەگەڵ کەسێک؛ ئاوێتە بوون لەگەڵ کەسێکدا ‹با هم خیلی ندار بودند: پێکەوە زور تێکەڵ بوون›.

**نداری** / nadārî ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* هەژاری؛ نەداری؛ فەقیری؛ نامانگووری؛ ناگوزووری؛ کەمەی.

**نداشتن** / nadāštan/ ☜ **داشتن**

**نداف** / naddāf ، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* ۱. هەلاج؛ پەڕەکار؛ پەڕەوان؛ پەڕەکەر؛ ڤەبسکوڕ؛ کەڤانژەن ۲. لێفدوور؛ لێفدروو.

**ندامت** / nedāmat, nadāmat/: [عربی] *اسم. [ادبی]* پەشیوانی؛ پەژیوانی؛ پێژەوانی؛ پژمانی؛ ژووڤانی؛ ڤەرگەڕ؛ ناسور.

**ندامتگاه** / nedāmatgāh, nadāmat- ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* زیندان؛ بەندیخانە؛ گرتووخانەیەک بۆ ڕاهێنان و بارهێنانی تازوبەزکاران و تاوانباران.

**ندانستن** / nadānestan/ ☜ **دانستن**

**ندانسته** / nadāneste/ ☜ **نادانسته**

**ندانم‌کاری** / nadānamkārî ، ـها/: *اسم.* نەزانکاری؛ هەڵەکاری بە هۆی نەزانی و بێئەزموونی و باش بیر نەکردنەوە ‹در کارهای این سیاستمداران ندانم‌کاری دیده می‌شود: لە کاری ئەم ڕامیارانەدا نەزانکاری دەبینرێت›. هەروەها: **ندانم‌کار**

**ندبه** / nodbe ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ۱. گریان؛ شین؛ زاری؛ ڕۆ-ڕۆ؛ شیوەن ۲. گلە؛ گازندە؛ بناشت؛ بنداشت.

**ندراندن** / nadarāndan/ ☜ **دراندن**

**ندرت** / nodrat/: [عربی]/اسم. دەگمەنی؛ کەمی؛ وێزەیی؛ چکێنی.

▣ به ندرت: بە دەگمەن؛ تاک‌وتووک؛ زۆر کەم ‹به ندرت دیده شده است: بە دەگمەن بینراوە›.

**نـدرتاً** / nodratan/: [عربی] قید. بەدەگمەن؛ تاک‌وتووک؛ زۆر کەم؛ بەکەمی؛ جارجارە ‹ندرتا او را می‌دیدم: بەدەگمەن دەمبینی›.

**ندرخشیدن** / naderaxšîdan, nadaraxšîdan/ ☜ درخشیدن

**ندرویدن** / naderavîdan/ ☜ درویدن

**ندریدن** / nadarîdan/ ☜ دریدن

**ندزدیدن** / nadozdîdan/ ☜ دزدیدن

**ندمیدن** / nadamîdan/ ☜ دمیدن

**ندواندن** / nadavāndan/ ☜ دواندن

**ندوختن** / nadûxtan/ ☜ دوختن

**ندوشیدن** / nadûšîdan/ ☜ دوشیدن

**ندویدن** / nadavîdan/ ☜ دویدن

**ـ نده** / ande/: پسوند. ۱. ـ ئەر؛ نیشانەی ناو و ئاوەڵناوی کرگاری (بە ئاخری ڕەگی داهاتووی کارەوە دەلکێ) ‹شنونده: بیسەر› ۲. ـ بار؛ ـ زار؛ بە ئاخری ناو یان ئاوەڵناوەوە دەلکێ و ئاوەڵناو پێک‌دێنێ ‹شرمنده: خەجاڵەتبار›.

**ندید** / nadîd/: قید. [گفتاری] نەدیو؛ نەدیە؛ نەدیتە؛ نەدیگ؛ نەدیتوو؛ بێ تەمەشا کردن ‹ندید صد تومان می‌خرم: نەدیو سەد تمەن دەیکرم›.

▣ ندید گرفتن: چاو لێ‌قووچاندن؛ نەهێنانە بەرچاو؛ چاو پۆشان ‹کارش را ندید گرفتم و به روی خودم نیاوردم: چاوم لە کارەکەی قووچاند و خۆم لێ گێل کرد›.

**ندیدبدید** / nadîdbedîd، ـها/: صفت. [گفتاری] نەیبی؛ نەوبی؛ نەیوەی؛ نەدی‌بدی؛ تیکڵ؛ بە هەڵپەهەڵپ و چاوچنۆکی زۆرەوە لە ئاست شتی تازە و خۆش ‹این یارو خیلی ندیدبدید است: ئەم کابرایە زۆر نەببیە›.

**ندیدن** / nadîdan/ ☜ دیدن

**ندیده** / nadîde، ـها/: اسم. [گفتاری] ۱. نەدیتوو؛ ئەوی قەت نەبینراوە ۲. نەڤیچرک؛ نەوەزازا؛ نەتیجە؛ پشتی چوارەم ۳. نەدیتە؛ زارۆکی نەوەزازا؛ پشتی پێنجەم.

**ندیم** / nadîm/: [عربی]/اسم. ئامپیالە؛ هاودەم؛ هامدەنگ؛ هاونشین؛ هاوکردار و هۆگر.

**ندیمه** / nadîme، ـها؛ ـگان/: [عربی]/اسم. هاودەم؛ هامدەنگە؛ هاونشین؛ ژن و کچی هەڵبژاردە بۆ هاودەمی کچ یان ژنە دەوڵەمەندان.

**نذر** / nazr، ـها؛ نُذور/: [عربی]/اسم. نیاز؛ نەزر؛ نەزرە؛ نەدر؛ فوتو: ۱. بەڵێن بە خودا و چاکان بۆ جێبەجێ‌کردنی کارێک بەو مەرجەی ئاواتی بێتە دی ‹نذر کرده بود اگر آرزویش برآورده شود یک گوسفند قربانی کند: نیازی کردبوو ئەگەر ئاواتی بێتە دی مەڕێک قوربانی بکا› ۲. ئاواتێ کە بەم شێوە بەدی‌هاتووە ‹نذرم برآورده شد: نیازم هاتەدی›.

▣ نذر داشتن: نیاز لە سەر بوون؛ لە بەر نیاز، کارێک لە ئەستۆ بوون ‹نذر داشت یک گوسفند قربانی کند: نیازی لە سەر بوو پەزێک بکاتە قوربانی›.

نذر کردن: نیاز کردن؛ نەزرکردن؛ بە نیاز، کارێک گرتنە ئەستۆ.

نذر کسی برآورده شدن: نیازی کەسێک هاتنە دی؛ نەزری کەسێ گرتن.

**نذر و نیاز** / nazr-o-niyāz، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. نەزر و نیاز ‹خیلی نذر و نیاز کرد تا بلکه شوهرش برگردد: زۆرێک نەزر و نیازی کرد بەڵکوو مێردەکەی بگەڕێتەوە›.

**نذری[1]** / nazrî، ـها؛ نذورات/: [عربی] صفت. نەزری؛ نیازکراو؛ بەرهەم‌هاتوو بە هۆی نیازەوە ‹آش نذری: چێشتی نەزری›.

**نذری[2]**: قید. [گفتاری] بە بەلاش؛ بە مفتی؛ مفت و مەرحەبایی ‹آزاد نذری کار می‌کند: ئازاد بە بەلاش کار دەکات›.

**نذور** / nuzûr, nozûr/: [عربی] جمعِ ☜ نذر

**نذورات** / nuzûrāt, nozûrāt/: [عربی] جمعِ ☜ **نَذری**

**نر** / nar ، ـها/: *صفت.* نێر؛ نەر؛ سەر بە ڕەگەزێ کە باڵغەکەی دەتوانێ بە لفگری ڕەگەزی مێوینەی خۆی ئاوس بکا. بەرانبەر: **ماده**

◘ نر را دوشیدن:*[مجازی]* نێر دۆشین؛ هەوڵی فێڕۆ دان بۆ شتێ لە شوێنێکدا کە هەر لەوێ نەبێ یان بۆ کارێ کە قەت سەرنەگرێ.

**نراد** / narād/: [؟]/*اسم.* چێوی داری لێڕەواران؛ چێوی پیشەسازی.

**نـراد** / narrād/: [از نـرد بـه قاعـدەی عربـی] *صفت.* تەختەباز؛ تەختەزان؛ دەستباڵا لە کایەی تەختەنەرددا.

**نراندن** / narāndan/ ☜ **راندن**

**نربودن** / narobûdan, narubûdan/ ☜ **ربودن**

**نرخ** / nerx ، ـها/: *اسم.* ۱. نرخ؛ بایی؛ قیمەت؛ حەق؛ بهێ؛ بەها؛ بایەخی داندراو بۆ هەرشتێ بە پێی پارە ‹نرخ آهن: نرخی ئاسن› ۲. مەزەندە؛ مەزەنە؛ مەزندە؛ مەزنە؛ مەزەننە؛ ڕێژە؛ ئەندازە ‹نرخ رشد جمعیت: مەزەندەی زۆر بوونی جەماوەر›.

◘ نرخ برابری: بایی هاوتا؛ نرخی هاوتا؛ نرخی پارەی ولاتێک لە چاو ولاتێکی‌تر.

نرخ بهره: نرخی سوو؛ بایی سوو؛ ڕێژەی سووی پارە (سپاردە یان وام) لە ساڵێکدا، بە گوێرەی لەسەد ‹نرخ بهرەی این بانک ۲۵٪ است: نرخی سوودی ئەم بانکە ۲۵٪ ە›.

◘ نرخ شکستن: ۱. شکان؛ هاتنە خواری نرخ ۲. شکانن؛ شگیناندن؛ نرخ مارتەی؛ هەرزان‌کردن.

**نرخگذاری** / nerxgozārî ، ـها/: *اسم.* کار یا ڕەوتانەی نرخ بۆ دانان؛ نرخ لێنان؛ بایی بۆ شتێک بڕیار دان.

**نرد** / nard/: *اسم.* ۱. نەرد؛ تەختەنەرد؛ تاوڵە؛ تاوڵی؛ گەمەی تاوڵی ۲. *[قدیمی]* کۆتەرە؛ کوتاری دار.

◘ نرد عشق باختن:*[مجازی]* دڵ دانان/ سپاردن؛ دڵداری کردن؛ ئەوینداری‌کردن.

**نردبام** / nardebām, nard(a)bām/ ☜ **نردبان**

**نردبان** / nardebān, nard(a)bān ، ـها/: [فارسی/ کردی]/*اسم.* پەیژە؛ پەیجە؛ پەینجە؛ پایەنجە؛ پاپەینجە؛ پاچینە؛ بەیجە؛ ترنجە؛ پاپەنجە؛ پاپاچینە؛ سلەم؛ سولەم؛ نەردیوان؛ ناردیوان؛ نێردیوان؛ نەردەوان؛ ناردانی؛ نەردەوانێ؛ نەردانێ؛ نەردونگ؛ بەرکەک؛ ستر؛ پسترک؛ پیسترک؛ مەردیشان؛ قادرمە؛ سەردووک؛ پێ‌بلقە؛ ناردانی؛ کەرستەیەکی لە چێو یان کانزا بۆ پێدا هەڵگەڕان: **نردبام**

◘ نردبان نَنابی: پەیژەی تەنافی؛ پەیژەی لە گوریس کە سانا کۆ دەبێتەوە و هەڵدەگیرێ.

نردبان دزد:*[مجازی]* پەینجەی جەحەنم؛ درێژ تا ئێوارە؛ شقارە؛ مرۆی درێژی نابار.

◘ نردبان ترقی را پیمودن: پلەپلە سەرکەوتن ‹نردبان ترقی را پیمود و شد رئیس اداره: پلەپلە سەرکەوت و بوو بە سەرۆک›.

نردبان کسی شدن:*[مجازی]* بوونە پلە/ پردی کەسێ؛ بوونە هۆی سەرکەوتن و پێشکەوتنی کەسێک.

**نردبانی** / nardebānî, nard(a)bānî/:[فارسی/ کردی] *صفت.* پەیژەیی؛ نەردیوانی؛ پەیجەیی؛ وەک پەیژە.

**نرده** / narde ، ـها/: *اسم.* نەردە؛ نەردێ: ۱. لاجامە (ئی بەرهەیوان)؛ مێردڕەوە (لێواری بان)؛ دەرەج؛ تەختەبەن؛ محەجەری؛ محەجەرە؛ مەعجەرە؛ پێکهاتەیەک لە ڕزنێ میلەی چێوی یان کانزایی کە لە سەر و خوارەوە بە دوو میلەی درێژ داکشاو گیردراون بۆ پەڕاپەری سەربان یان پەنای پلیکان و... ۲. هەر کام لە میلەگەلی ئەو پێکهاتەیە.

◘ نرده کشیدن: نەردەکێشان ‹بعد از آن کنار پیادەروها نرده کشیدند: پاش ئەوە لێواری

پیادەڕەوەکانیان نەردە کیشا›.

**نرس** / ners ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. پەرەستار؛ پەرستار.

**نرستن** / narastan/ ☜ **رَستن**

**نرستن** / narostan/ ☜ **رُستن**

**نرسیدن** / naresîdan, narasîdan/ ☜ **رسیدن**

**نرفتن** / naraftan/ ☜ **رفتن**

**نرقصاندن** / naraqsāndan/ ☜ **رقصاندن**

**نرقصیدن** / naraqsîdan/ ☜ **رقصیدن**

**نرک** / narak/: [از کردی]/اسم. نێرکە؛ نێرۆک؛ نێرۆکە: ١. ئەو لقە ڕاستەی هەمیشە هەڵدەچێ ٢. لاسکێ کە سەر پۆپەی گوڵ دەکا و دەبێتە تۆم.

**نرگس** / narges ، ـها؛ ـان/: [از یونانی]/اسم. نێرگز؛ نەرگز؛ نەرگس؛ نێرگس؛ نەریس؛ نێریس؛ زەرییم؛ گوڵێکی سپی ناوزەردی زۆر بۆنخۆشە، بنکی هەیە و لە سەر بەهاردا دەڕوێ.

◙ **نرگس درختی**: نێرگسە درەختی.

**نرگس زرد**: زەردە نێرگز؛ جۆرێ نێرگز بە گوڵ و جامی زەردەوە.

**نرگس شهلا**: جۆرێک نێرگز بە گوڵی سپی و جامی زەردەوە.

**نرگسی** / nargesî/: [از یونانی]/اسم. نەرگسی؛ نێرگسی؛ چێشتێکی بێ گۆشتە لە هێلکە، ڕۆن، پیواز، خوێ، بیبار، ئەسپەناخ و بەتایبەت باینجان و کوولەکە.

**نرم**[1] / narm/: صفت. نەرم؛ نەمر؛ نەرمژ: ١. هۆک؛ نوڵ؛ بە تایبەتمەندی نووشتانەوەی زۆرەوە ‹پارچەی نرم: قوماشی نەرم› ٢. ناڕەق. بەرانبەر: **سفت** ‹زمین نرم: زەوینی نەرم› ٣. لووس؛ هلوولس؛ ساف؛ ناسک و شلک. بەرانبەر: **زبر** ‹پوست نرم: پێستی نەرم› ٤. [مجازی] نەرمونیان؛ نازک؛ مەلاهیم؛ بەبێ توندی و تووڕەیی. بەرانبەر: **خشن** ‹صدای نرم: دەنگی نەرم› ٥. [مجازی] هاسان؛ ئاسان؛ گانگاز.

◙ **نرم شدن**: [مجازی] نەرم بوونەوە؛ هوور بوونەوە ‹آنقدر با او حرف زدم که کم‌کم نرم شد: ئەوەندە قسەم لەگەڵ کرد نەختەنەختە نەرم بووەوە›.

**نرم کردن**: نەرم کردن؛ گواندن: ١. هاڕین؛ وردکردن؛ کردنە ئارد ٢. سەر پێ دانەواندن؛ هێنانە ژێر ڕکێف.

**نرم**[2]: قید. نەرم؛ بە نەرمی؛ بە شێنەیی؛ ڕەوان ‹ماشین نرم کار می‌کرد: ماشینەکە نەرم کاری دەکرد›.

**نرم** / norm ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. هەنجار؛ پێوڕ؛ نورم؛ ڕادەی ئاسایی یان خوازراوی شتێک.

**نرـماده** / narmāde/: صفت. نێرـما؛ نێرـمێو؛ نێر و ما؛ نێرامێ: ١. [گیاه‌شناسی] بە هەر دوو ئەندامی نێر و مێ دە گوڵدا ٢. [جانورشناسی] خاوەنی هەر دوو ئەندامی نێر و مێ: **نرموک**.

**نرم‌استخوانی** / narmostoxānî, -'ostexānî/: اسم. ئێسک‌نەرمی؛ نەرمێسکی؛ نەرم بوونەوەی ئێسکی لەش وێڕای ژان و ئێش، لاواز بوونەوەی ماسوولکە، دڵ نەبردن و پێچوون بە هۆی کەمایەسی لە ڤیتامینی «د» یان کەلسیۆم و فوسفوڕ.

**نرم‌افزار** / narmafzār ، ـها/: اسم. نرمامێر؛ سەرجەمی بەرنامە، کردەوە و بەڵگەگەلی ئامێرێک، بەتایبەت لە کەمپیوتەردا.

**نرمال** / normāl ، ـها/: [فرانسوی/ انگلیسی] صفت. ١. ئاسایی ٢. سروشتی ٣. گونجاو؛ لەپۆڕ؛ لەبار.

**نرماندن** / naramāndan/ ☜ **رماندن**

**نرمباندن** / narombāndan/ ☜ **رمباندن**

**نرمبیدن** / narombîdan/ ☜ **رمبیدن**

**نرمتن** / narmtan ، ـها؛ ـان/: اسم. نەرملەش؛ گیانداری بێ‌مۆرەغەی لەش شلک کە زۆرتر پێستەیەکی ناسک دایپۆشیوە و لە نێو قەپاتێکی ڕەق و پتەودایە.

**نرمخو** / narmxû ، ـها؛ ـیان/: صفت. [مجازی، ادبی] لەسەرخۆ؛ هێمن؛ بەپشوو؛ هێدی؛ پشوودرێژ؛

پشوودار؛ مەند؛ مەن؛ نەرم و نیان. هەروەها: **نرمخویی**

**نرمش** / narmeš/: *اسم*. ۱. *[مجازی]* سازگاری؛ تەبایی ‹با همه نرمش داشت جز من: لەگەڵ هەموو کەسێکدا سازگاری هەبوو بێجگە من› ۲. *ــها*/ نەرمش؛ نەرمشت؛ جووڵە و بزاوی وەرزشی بۆ بەهێزکردن و ڕاهێنانی ماسوولکەی لەش.

**نرمشامه** / narmšāme/: *اسم*. *[کالبدشناسی]* ناوەکیترین پەردەی دەوری مێشک کە پێوە لکاوە، بە ڕەگێکی زۆرەوە بۆ خوێن دان بە مێشک و مۆخ.

**نرمکامه** / narmkāme/: *اسم*. *[کالبدشناسی]* مەلاژ؛ مەلاشوو؛ مەلاژگ؛ مەلاشک؛ مەلاژی؛ بنی ئاسمانەی دەم کە نەرمە و پەردەیەک دایپۆشیوە.

**نرمک ـ نرمک** / narmaknarmak/ ☜ **نرم ـ نرمک**

**نرم ـ نرمک** / narmnarmak/: *قید*. وردە ـ وردە؛ هێدی ـ هێدی؛ شلە ـ شل؛ نەرم ـ نەرم؛ نەرمە ـ نەرم؛ نەرمەنەرمە؛ بە نەرمی؛ بە ئەسپایی؛ وە سپاییەو؛ بە هێدیکایی؛ بە هێوری ‹نرم ـ نرمک قدمی برمی‌داشت: هێدی ـ هێدی هەنگاوێکی دەگۆزاوە›: **نرمک ـ نرمک**

**نرموک** / narmûk/ ☜ **نرـ ماده ـ ۲**

**نرمه** / narme، ـها/: *اسم*. نەرمێنە؛ نەرمە؛ نەرمک؛ نەرمۆک: ۱. نەرمەڵانی؛ بەشی نەرمی شتێک ‹نرمەی گوش: نەرمێنەی گوێ› ۲. خاک یان ماسەی نەرم ۳. ئەوەی بە تەواوی ورد کرابێ. بەرانبەر: **زبره**

▣ نرمەی گوش: بەلک؛ گووهوک؛ نەرمێنەی گوێ؛ جێگوارە؛ بەلگەی گوێچکە؛ شلکەی گۆش.

**نرمی** / narmî/: *اسم*. نەرمی؛ شلکی.

**نرمیدن** / naramîdan/ ☜ **رمیدن**

**نرنجاندن** / narancāndan/ ☜ **رنجاندن**

**نرنجیدن** / narancîdan/ ☜ **رنجیدن**

**نرو** / narow, naro/: *صفت*. *[مجازی، گفتاری]* لاسار؛ یاخی؛ سەربزێو؛ شەقی؛ ناتەبا؛ نەبان؛ گوێنەبیس.

**نرونیدن** / narû'îdan/ ☜ **نروییدن**

**نروبیدن** / narûbîdan/ ☜ **روبیدن**

**نروک** / narûk/: *صفت*. ۱. هۆڕ؛ ناخار؛ ناقۆڵا ۲. بێبەر(بۆ گیا) ۳. *[کنایی]* نەزۆک (بۆ گیانەوەر).

**نرون** / noron/: [فرانسوی] ☜ **نورون**

**نرویاندن** / narûyāndan/ ☜ **رویاندن**

**نروییدن** / narûyîdan/ ☜ **روییدن: نروئیدن**

**نره ـ** / narre/: *پیشواژە*. نێرە ـ ؛ نەڕە ـ ؛ گیانداری نێر ‹نەرەخر: نێرەکەر›.

**نرهاندن** / narahāndan/ ☜ **رهاندن**

**نری** / narî/: *اسم*. نێری؛ نەڕی؛ نێرینەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی نێر بوون.

**نریان** / nariyān، ـها/: *اسم*. ئەسپ؛ جووتی مایین.

**نریختن** / narîxtan/ ☜ **ریختن**

**نریدن** / narîdan/ ☜ **ریدن**

**نریسیدن** / narîsîdan/ ☜ **ریسیدن**

**نرینه** / narîne، ـها/: *اسم*. نێرەوەز؛ نێرینە. بەرانبەر: **مادینه**

**نزائیدن** / nazā'îdan/ ☜ **نزاییدن**

**نزادن** / nazādan/ ☜ **زادن**

**نزار** / nazār, nezār، ـها/: *صفت*. نزار؛ کز: ۱. لاواز؛ لەڕ ۲. ژار؛ زار؛ ناچاخ؛ بێکەیف.

**نزاع** / nezā'، ـها/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* شەڕ؛ داوا؛ گەلش: ۱. کێشە؛ قەرقەش؛ خەرخەشە؛ کێشە و هەرا؛ چەقە و هەرا؛ کێشەکێش؛ پاپی؛ جراجر؛ هەلا ۲. شەڕ و لێدان؛ مشتومڕ؛ خڕ و جز؛ ململانە.

**نزاکت** / nezākat, nazākat/: [عربی] *اسم*. نەزاکەت؛ هەڵسوکەوت و کردەوەی بەرامبەر بە داب‌ونەریت ‹نزاکت سرش نمی‌شود: نەزاکەت سەری نابێتەوە›.

**نزاياندن** / nazāyāndan/ ☜ **زاياندن**

**نزاييدن** / nazāyîdan/ ☜ **زاييدن؛ نزائيدن**

**نزد** / nazde/: *حرف.* پاڵ؛ پاڵی؛ لاپاڵی؛ لای؛ لال؛ لجەم؛ لەکن؛ لەکنی؛ نک؛ لەنک؛ لنک؛ لبا؛ لایەن؛ لایین؛ لبال؛ لە لا؛ هند؛ لە پەنای؛ هۆست؛ ئامی؛ هاف؛ تەنشتی؛ تەشک؛ نەر؛ کەرخ؛ هەتەگ؛ هەتە؛ هەت؛ بال؛ دۆن؛ دەڤ؛ هێم؛ دیار؛ لێئانین؛ کست؛ لاو؛ نزیکی؛ نزیکوو؛ پاڵی؛ پاڵوو ‹نزد دیوار؛ رفتم نزد رئیس؛ کلید نزد من است: پاڵ دیوار؛ ڕۆشتم بۆ لای سەرۆک؛ کلیدەکە لەکن منە›.

**نزدودن** /nazedûdan, nazudûdan, nazodûdan/ ☜ **زدودن**

**نزديک** / nazdîk/: *صفت.* نزیک؛ نێزیک؛ نزاو: ۱. نێز؛ نزینگ؛ لوێ؛ نمنگ؛ نێژ؛ نەژدی؛ نێژدی؛ دۆن؛ بە مەودایەکی کەمەوە ‹شب نزدیک است: شەو نزیکە› ۲. بە جیاوازیەکی کەمەوە ‹رنگها به هم نزدیک بود: ڕەنگەکان لێک نزیک بوون› ۳. نێوانخۆش ‹با هم نزدیک بودیم: پێکەوە نزیک بووین›.

◘ نزديک بودن: نێزیک/ نزیک بوون؛ نەدوور بوون؛ دوور نەبوون ‹خانەشان نزدیک است: ماڵەکەیان نێزیکە›.

نزديک شدن: نێزیک/ نزیک بوونەوە؛ نزیکەوە بیەی: ۱. مەودایەکی زۆر نەمان ‹به او نزدیک شدم: لێی نزیک بوومەوە› ۲. هاتنە بەرەوە؛ گەیشتن ‹عید نزدیک است: جێژن نزیکە›.

نزديک شدن به کسی: نزیک بوونەوە لە کەسێ؛ نێوان خۆش بوون لەگەڵ کەسێدا.

**نزديکِ** / nazdîke/: *حرف.* لە لای؛ نزیکی؛ نزیکوو؛ لاو؛ لە نزیکی؛ لە کنی؛ توخنی؛ تخوونی؛ کوشی؛ بنباڵی؛ لە تەنیشتی؛ لە پاڵی؛ لە بنباڵی؛ لە نزاوی؛ لە نزیک کەس یان شتێکەوە ‹نزدیک من نشست: لە لای منەوە دانیشت›.

**نزديکان** / nazdîkān/: *اسم.* خزمان؛ خوێشان؛ نێزیکان؛ نزیکێ؛ خزم وکەسی نزیک.

**نزديکبين** / nazdîkbîn، ـها/: *صفت.* نزیکبین: ۱. تایبەتمەندی چاوی تووش بە نەخۆشی نزیکبینی ۲. *[مجازی]* بێوەری لە وردبینی و تێبینی.

**نزديکبيني** / nazdîkbînî/: *اسم.* نزیکبینی: ۱. جۆرێک کەمایەسی لە بینایی چاودا ۲. *[مجازی]* بار و دۆخی بێوەری لە وردبینی و دووربینی.

**نزديکي** / nazdîkî، ـها/: *اسم.* نزیکی؛ نێزیکی: ۱. دۆخ و چۆنیەتی نزیک بوون ‹نزدیکی راه باعث شد اینجا خانه بخرم: نزیکی ڕێگا بوو بە هۆی ئەوە لێرە ماڵ بکڕم› ۲. کار و ڕەوتی دامەزراندنی پێوەندی ‹کار مشترک موجب نزدیکی بیشترشان شد: کاری هاوبەش بووە هۆی نزیکی پتریان› ۳. *[مجازی]* هاوجێی؛ پێوەندی جنسی ٤. شوێنی نزیک ‹در آن نزدیکی خانه‌ای است: لەو نیزیکیە ماڵێک هەیە›.

◘ نزديکی کردن: ۱. نزیک بوونەوە؛ دامەزراندنی پێوەندی ۲. *[مجازی]* نزیکیکردن؛ هاوجێی کردن.

**نزع** / naz'، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* سەرەمەرگ؛ گیانەلا؛ ئاویلکە؛ گیانەلاو؛ ئاوەزینگ؛ ئاوزینگ؛ گیانان؛ گیانکەنشت؛ ڕەوتی گیان دان.

**نزله** / nazle/: [عربی] *اسم.* هەلامەت؛ پەسیوی؛ مرفینگ؛ بەر بوونەوەی ئاوی چاو و لووت هاوڕێ لەگەڵ هەڵماسین و سوورهەڵگەڕانی سەر و چاو.

**نزول** / nuzûl, nozûl/: [عربی] *اسم.* ۱. کار یا ڕەوتی هاتنە خوارەوە؛ دابەزین؛ ئامایرە وار؛ دادان؛ ئەرەئامەی؛ وەرهاتن ‹نزول باران: هاتنە خوارەوەی باران› ۲. *[گفتاری]* سوو؛ سووت؛ بەهرەی پارە ‹هر ماه نصف درآمدم را نزول می‌دهم: هەموو مانگێ نیوەی داهاتم سوو دەدەم›.

▣ نزول اجلال کردن: *[ادبی]* تەشریف هێنان.
نزول کردن: بە سوو هێنان؛ وام بە سوو هاوردن ‹پول بیمارستان را نزول کرده: خەرجی نەخۆشخانەم بە سوو هینا›.
**نزولات جوی** / nuzûlātecavvî, nozûlāte- /: [عربی] *اسم.* ئەوەی لە هەورەوە دەباریٚ (وەک باران و بەفر و تەرزە).
**نزولخوار** / nuzûlxār, nozûl- /: [عربی/ فارسی] ☜ **نزولخور**
**نزولخور** / nuzûlxor, nozûl- /، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *اسم. [گفتاری]* سووخۆر؛ سووخوەر؛ سووتخۆر: **نزولخوار**
**نزولی** / nuzûlî, nozûlî /: [عربی] *صفت.* ۱. سەرەوخوار؛ سەرەوژێر؛ بەرەوخوار ‹سیر نزولی؛ منحنی نزولی: ڕەوتی سەرەوخوار؛ کەوانەی سەرەوژێر› ۲. داباریو؛ باریو ۳. تایبەتمەندی پارەیەک کە بە سوو هاتووە
**نزهت** / nozhat, nezhat /: [عربی] *اسم. [نامتداول]* خۆشی؛ شادی؛ گەشی.
**نزیبیدن** / nazîbîdan / ☜ **زیبیدن**
**نزیستن** / nazîstan / ☜ **زیستن**
**نژاد** / nejād، ـها/: *اسم.* ڕەگەز؛ بنیچە؛ نژاد؛ نەژاد؛ سۆلان؛ ڕەسەن؛ ڕەگ؛ بنەڕەت؛ تۆرەمە؛ ڕەچەڵەک؛ بنەچەک؛ بنەچەکە؛ بنەچەق؛ بنچینە؛ توخم؛ خیم؛ کۆک؛ تۆمە؛ ڕەتەوە؛ تروم؛ وەچ و بەرە؛ چین؛ نوادە؛ لانەما؛ نەتەوە: ۱. تاقمیٚ لە گیاندارانی سەر بە یەک تیرە، کە نێر و مێیان پێکەوە جووت دەبن ۲. دەستەیەک لە خەڵک، بە شێوە و ڕواڵەتی وەکوو یەک (وەک ڕەنگی پێست، قژ یان چاو) ۳. هۆز یان خەڵکی هاوپشت ٤. خەڵکی سەر بە یەک هۆز و گەل.
▣ نژاد سفید: سپی پێست. هەروەها: **نژاد سیاه؛ نژاد زرد؛ نژاد سرخ**
**نژادپرستی** / nejādparastî /: *اسم.* ڕەگەزپەرستی: ۱. بڕوا بەوەی کە ڕەگەز و تۆرەمە بۆ هێژایی و لێهاتوویی دەوری کارای هەیە ۲. بڕوا بەوەی کە ڕەگەز و تۆرەمەیەکی تایبەت مافی جیاواز و زۆرتریان هەیە.
**نژادشناسی** / nejādšenāsî / ☜ **انسان‌شناسی**
**نژاده** / nejāde /: *صفت. [ادبی]* ڕەسەن؛ هیلاو؛ گران؛ نەجیم؛ ڕەگەزچاک؛ بەبناوان؛ ڕەگەزدار؛ خانەدان؛ بنەچەدار.
**نژادی** / nejādî /: *صفت.* ڕەچەڵەکی؛ ڕەگەزی.
**نژند** / najand /: *صفت. [ادبی]* ۱. ڕەنجاو؛ دڵشکاو؛ پەشێو؛ پەژار؛ داچەکاو؛ خەمین ۲. ئازاردیتوو ۳. نەچیٚ؛ ناحەز؛ دزێو؛ قیزەون.
**نسائیدن** / nasā'îdan / ☜ **نساییدن**
**نساج** / nassāc، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم.* جۆلا؛ چنیار.
**نساجی** / nassācî، ـها/: [عربی] *اسم.* جۆلایی؛ چنیاری.
**نساخ** / nassāx، ـها؛ ـان/: [عربی] *اسم. [ادبی]* نووسەرەوە؛ ڕوونووسکەر.
**نساخ** / nossāx /: [عربی] جمعِ ☜ **ناسِخ**
**نساختن** / nasāxtan / ☜ **ساختن**
**نسار** / nasār /: [کردی] *اسم.* نسار؛ نزار؛ پەسار؛ نسرم؛ نێڵ؛ شوێنیٚ کە تاو نایگریٚ، بەرانبەری خوەرەتاو: **نَسَر**
**نساییدن** / nasāyîdan / ☜ **ساییدن؛ نسائیدن**
**نسب** / nasab، ـها؛ انساب/: [عربی] *اسم.* پشت؛ ناوپشتە؛ تۆرەمە؛ ڕەتەوە.
**نسبت** / nesbat، ـها/: [عربی] *اسم.* ۱. پێوەند؛ پێوەن؛ ڕێژە ‹نسبت ۳ به ۴، مانند ۶ است به ۸: پێوەندی ۳ بە ٤، وەکوو ٥٦ بە ٨› ۲. خزمایەتی؛ پێوەندی ‹با ما نسبت دوری دارد: خزمایەتیەکی دووری لەگەڵمان هەیە›.
▣ نسبت به: ۱. لەمەڕ؛ سەبارەت بە؛ لە حەنای؛ لە حاندی ‹نسبت به او بدی کردند: لەمەڕ ئەو خراپەیان کرد› ۲. لە چاو؛ بە پێی؛ لە پای؛ وە

پای؛ پاو؛ لە هەمبەر؛ لە ئاست ‹نسبت به جاهای دیگر ارزان است: لە چاو شوێنانی‌تر هەرزانە›.

**نسبت سببی:** خزمایەتی بە ژن و ژنخواز.

**نسبت نسبی:** خزمایەتی بە خوێن.

▣ **نسبت دادن:** ڕەپاڵ دان؛ پێوە خستن؛ ڕەگەڵ خستن ‹همەی بدبختی‌هایمان را بە تقدیر نسبت می‌دادند: هەموو کوێرەوەریەکمان ڕەپاڵ چارەنووسی دەدەن›.

**نسبتاً / nesbatan/:** [عربی] *قید.* تا ڕادەیەک؛ کەم تا فرە؛ تا ئەنازێو ‹نسبتاً رشد کرده بود: تا ڕادەیەک گەشەی کردبوو›.

**نسبی / nasabî/:** [عربی] *صفت.* خوێنی ‹خویشاوند نسبی: خزمی خوێنی›.

**نسبی / nesbî/:** [عربی] *صفت.* ڕێژەیی: ۱. پێوەندیدار بە ڕێژەوە ‹رشد نسبی: گەشەی ڕێژەیی› ۲. خاوەنی ڕێژە ‹این کە می‌گویند نسبی است، هم می‌تواند کم و هم زیاد باشد: ئەمەی دەیڵێن ڕێژەییە، هەم دەکرێ زۆر بێ هەم کەم›.

**نسبیت / nesbiyyat/:** [عربی] *اسم.* دۆخ و چۆنیەتی ڕێژەیی بوون.

**نسپردن / nas(e)pordan/** ☜ **سپردن**

**نسپوختن / nasepûxtan/** ☜ **سپوختن**

**نستالژی / nostāljî/:** [فرانسوی] *اسم. [روان‌شناسی]* نوستالژی: ۱. مەراق؛ تامەزرۆیی زۆر و لەڕادەبەدەر بە گەڕانەوە بۆ شوێن یان سەردەمێکی بگاردە کە تازە نایەتەوە ۲. دەردی غەریبی؛ خەم و ئازاری دووری لە نیشتمان، بنەماڵە و دۆستان.

**نستاندن / nasetāndan/** ☜ **ستاندن**

**نستردن / nasetordan/** ☜ **ستردن**

**نسترن / nastaran/**، ـها: *اسم.* شیلان؛ گوڵەشیلان؛ شیلانەدەشتی؛ ولەتووتی؛ دلق؛ دلقی؛ دلیق؛ دلێق؛ جلێق؛ جلێق؛ ولەتووت؛ ناوی: ۱. ناوی دارچکێکی گەلا پێنج یا حەوت‌پەڕی گوڵ‌تاک یان کۆیە ۲. گوڵی ئەو دارچکە کە بە ڕەنگی سپی و ئاماڵ‌سوورە لە ڕۆز دەکا بەڵام گچکەتر و کەم‌پەڕترە.

**نستعلیق / nasta'lîq/:** [عربی] *اسم.* نەستەعلیق؛ لە شێوە نووسینەکانی ئێرانی کە لە سەدەی نۆی کۆچیدا لە ئاوێتەکردنی دوو خەتی نەسخ و تەعلیق بەدیهات.

▣ **نستعلیق حرف زدن:** *[تعریض]* کتێوی قسە کردن.

**نستودن / nasetûdan, nasutûdan/** ☜ **ستودن**

**نستوری / nastûrî/** ☜ **نسطوری**

**نستوه / nastûh/:** *صفت. [ادبی]* بەگیرگە؛ نەبەز؛ کۆڵ‌نەدەر؛ دەست‌هەڵنەگر.

**نسج / nasc**، ـها؛ نُسوج؛ أنساج/: [عربی] *اسم.* ۱. *[نساجی]* کر؛ هۆنە؛ بافت؛ وەن؛ هۆنراو؛ تەنراو ۲. *[زیست‌شناسی]* شانە؛ کۆمەڵە خانەی وەکوو یەک کە پێکەوە کارێک دەکەن ‹نسج چربی: شانەی چەوری›.

**نسخ / nasx/:** [عربی] *اسم.* ۱. کار و ڕەوتی هەڵوەشاندنەوە؛ تێکدان؛ مەرکاندن (وەکوو قانوون، داب و دەستوور و...) ۲. نەسخ؛ شێوە نووسینێکی وڵاتە ئیسلامیەکان، زۆرتر بۆ نووسینەوەی قورئان.

**نسخ / nosax/:** [عربی] جمعِ ☜ **نسخه**

**نسخه / nosxe**، ـها؛ نُسَخ/: [عربی] *اسم.* ۱. نوسخە؛ نوشتە؛ ڕاچێتە؛ ڕاسپاردەی نووسراوی بژیشک بۆ نەخۆش ۲. بەرگ؛ یەکەی ژماردنی نووسراوە ‹یک نسخە از کتابش را برایم فرستاد: بەرگێک لە کتێبەکەی بۆم نارد› ۳. ڕوونووس ‹نسخە برداشتن: ڕوونووس کردن›.

▣ **نسخەی اصل:** دەقی سەرەکی؛ نموونەی جێ‌بڕوای نووسراوەیەک کە بنەمای لێکۆڵینەوەیەکە.

**نسخەی چاپی:** بەرگی چاپی؛ نموونەی چاپکراوی نووسراوەیەک.

**نسخەی خطی:** بەرگی دەسنووس؛

نموونەیەکی بە دەست نووسراوە لە دەقێک.

▣ **نسخه برداشتن:** ڕوونووس کردن؛ فەرکاندن؛ لێگرتنەوە؛ لە ڕوو نووسینەوە.

**نسخه پیچیدن:** نوسخە پێچان؛ کۆکردنەوە و ئامادەکردنی دەرمانگەلی نوسخەی بژیشک.

**نسخه نوشتن:** نوسخە نووسین؛ دەرمان نواندن.

**نسخەبدل** / nosxebadal ، ـها/: [عربی]/اسم. ڕوونووس؛ لێگرتەی دەقێک.

**نسخەبرداری** / nosxebardārî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. کار و ڕەوتی ڕوونووس کردن؛ لێگرتنەوەی دەقێک.

**نسر** / nasar/: [از کردی] ☜ **نَسار**

**نسر** / nasr/: [عربی]/اسم. [نجوم] نەسر؛ ناوی دوو هەسارەی بە تیشک و تاوە لە وێنە گەردوونیەکانی شەهێن و کیسەڵدا.

**نسرشتن** / nasereštan/ ☜ **سرشتن**

**نسرودن** / nasurûdan, nasorûdan/ ☜ **سرودن**

**نسریدن** / nasoridan/ ☜ **سریدن**

**نسرین** / nasrîn ، ـها/: اسم. نەسرین؛ گوڵەچیا؛ گوڵەبەرامە؛ ولەگولاوی؛ گیایەکی ڕازێنەیی پایای پیوازدارە بە گەڵای درێژی خێڕ- خێڕ و گوڵی بۆنخۆشی زەرد یان سپی هێشوویییەوە.

**نسطوری** / nastûrî ، ـها؛ ـان/: اسم. نەستووری؛ لە ڕێبازەکانی ئایینی مەسیحی کە لە کلیسەی ئۆرتودوکس بووەتەوە و شوێنکەوتوانی لە ئێران، عێراق، سووریە و لوبنان، بەتایبەت دە نێوان ئاسووریەکاندا دەژین: **نستوری**

**نسق** / nasaq/: [عربی]/اسم. ١. نەسەق؛ مافی کشت و کاڵ لە سەر مەزرای کەسیتر ٢. ڕێوڕەوش؛ ڕەوشت ٣. مەریس؛ دۆزنە؛ تەکووزی ٤. جزیا؛ سزا.

▣ **نسق کردن:** [قدیمی] سزا دان؛ تاوان دان.

**نسق گرفتن:** [مجازی] ئاوچاو سەندن؛ چاوترسێن کردن؛ جووچکەترسێن کردن؛ منداڵترسێن/ بەچەترسێن کردن؛ ترساندن.

**نسکافه** / neskāfe/: [فرانسوی]/اسم. نسکافە؛ ناوی بازرگانی بۆ قاوەی ساز کە پێویستی بە کوڵان و دەمکێشان نیە.

**نسل** / nasl ، ـها/: [عربی]/اسم. بەرە: ١. [زیستشناسی] تۆرەمە؛ ڕەچەڵەک؛ نەفش؛ نەوش؛ دەڨل؛ قنگەزە؛ کۆمەڵێک لە گیانداران کە پێکەوە بنەچەکەیەک بەدیدێنن ‹نسل بشر: بەرەی مرۆڤ› ٢. خەڵکی سەردەمێ ‹نسل بعد از جنگ اروپا: بەرەی پاش شەڕی ئورووپا› ٣. چەشن یان دەستەیەک لە شتومەکی سەر بە سەردەمێک ‹نسل سوم کامپیوتر: بەرەی سێهەمی کەمپیوتەر› ٤. تۆرەمە؛ ئەو کۆمەڵانەی بەر بە دوابڕانی ژینەوەران دەگرن ‹نسل گیاهان: بەرەی ڕوەک›.

▣ **نسل کسی/ چیزی برافتادن:** دوای کەسێ/ شتێک بڕان؛ قڕ تێکەوتن ‹نسل دایناسور برافتاده است: دایناسۆرەکان دوایان بڕاوە›. هەروەها: **نسل کسی/ چیزی را برانداختن**

**نسلفیدن** / nasolfîdan/: [؟] ☜ **سلفیدن**

**نسل کشی** / naslkošî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. گەلکوژی؛ بەرەکوژی؛ ژینوساید؛ کوشتاری بەکۆمەڵی گیاندارێک بۆ دوابڕینی تۆرەمەی.

**نسناس** / nasnās/: [عربی]/اسم. ١. ئوران ئوتان؛ ئورانگوتان؛ جۆرێ مەیموون ٢. مێردزمە؛ جانەوەرێکی دڕ و دزێو لە چیرۆکاندا ٣. زەبەلاح؛ زلحۆرت؛ جنێوێکە.

**نسنبیدن** / nasombîdan, nasonbîdan/ ☜ **سنبیدن**

**نسنجیدن** / nasancîdan/ ☜ **سنجیدن**

**نسوار** / nesvār/: [؟] ☜ **ناس**

**نسوان** / nesvān/: [عربی]/اسم. [ادبی] ژنان.

**نسوج** / nusûc, nosûc/: [عربی] جمعِ ☜ **نسج**

**نسوختن** / nasûxtan/ ☜ **سوختن**

**نسودن** / nasûdan/ ☜ **سودن**

**نسوز** / nasûz/: صفت. نەسۆز؛ ئاگرنەگر؛ بە

خۆگری لە بەرامبەر ئاورەوە ‹پنبەی نسوز: پەمووی نەسووچ›.

**نسوزاندن** / nasûzāndan/ ☜ **سوزاندن**

**نسیان** / nesyān/: [عربی]/اسم. فەرامۆشی.

**نسیم** / nasîm/:[عربی] /اسم. سروە؛ سۆسە؛ سووسە؛ شنە؛ شنەبا؛ شنۆ؛ شێنە؛ هۆنە؛ نەمرەیی؛ نەرمەبا؛ بای بسکان؛ وامیە؛ بای زۆر هێدی.

▣ **نسیم بامداد**: باد سحر ☜ **باد**

**نسیم صبح**: باد سحر ☜ **باد**

**نسیه**[1] / nesye/:[عربی] /اسم. قەرز؛ جۆرێ مامەڵە کە پارەکەی ماوەیەک دوای فرۆش بدرێ. بەرانبەر: **نقد**

**نسیه**[2]: قید. بە قەرز؛ قەرز؛ قەرزی.

▣ **نسیه آوردن**: قەرز هێنان؛ کڕینی شتومەک لە شوێنێک بە قەرز. هەروەها: **نسیه بردن؛ نسیه خریدن؛ نسیه دادن؛ نسیه فروختن؛ نسیه گرفتن**

**نسیه کاری** / nesyekārî/: [عربی/ فارسی]/اسم. قەرز و قەرزکاری؛ قەرزکاری؛ قەرز و قۆڵە؛ دان و ستان بە قەرز ‹پول کجا بود؟ همە کارشان نسیەکاری است: پووڵی چی؟ کاریان بۆتە قەرز و قەرزکاری›.

**نشا** / nešā ، ـها/: [از عربی]/اسم. ۱. چلاسک؛ شەتڵ؛ شەتلە؛ شتل؛ شتڵ؛ گیایێ کە بە بنەوە دەردێ و لە شوێنێکی تردا دەنێژرێتەوە ۲. چووز؛ چووزە؛ چەکەرە؛ چەقەرە؛ چووەرە؛ نێرتکی تازەدەرهاتووی گیا.

▣ **نشا کردن**: شەتڵ چاندن؛ شەتڵ نیان؛ کانەنیا؛ شەتڵ نیەی.

**نشأت** / naš'at/: [عربی]/اسم. ۱. چۆناوچۆنی یا ڕەوتی پەیدا بوون؛ سەرهەڵدان؛ ڕەخسان؛ بەدیهاتن؛ خویا بوون؛ هاتنە دی؛ کەوتەی دیار ۲. گەشە؛ گەشە و نەشە؛ پەروەرش؛ ڕەوتی بووژانەوە.

▣ **نشأت گرفتن**: ڕەخسان؛ سەرچاوەگرتن؛ هاتنە دی؛ سەرهەڵدان ‹این پیروزی از ایمان و اتحاد آنان نشأت گرفته است: ئەم سەرکەوتنە لە ئیمان و یەکیەتیانەوە ڕەخساوە›.

**نشادر** / nošādor/:/اسم. نۆشادر؛ خوێیەکی سپی، بێبۆن و تیژە لە ئاودا دەتوێتەوە و بۆ دەرمان دەشێ: **نوشادر**

**نشازار** / nešāzār/: [از عربی/ فارسی]/اسم. شتڵجاڕ؛ شەتڵجار؛ شەتلگە.

**نشاسته** / nešāste/:/اسم. نشاستە؛ گەردێکی سپیە، لە ئاو، ئەلکولدا دەتوێتەوە، لە شی بوونەوەدا دەبێتە چەن جۆر دکسترین و گلۆکۆز، لە گیادا بە شێوەی هیدراتی کەربون پاشەکەوت دەبێ، زۆر ماکی خۆراکی، چەسپ و دا و دەرمانی لێ بەرهەم دێنن.

▣ **نشاستەی حیوانی**: گلیکۆژین؛ نیشاستەی ئاژەڵی.

**نشاستەای** / nešāste'î/: صفت. نیشاستەیی: ۱. لە جنسی نیشاستە ۲. بە نیشاستەوە.

**نشاشیدن** / našāšîdan/ ☜ **شاشیدن**

**نشاط** / nešāt, našat/: [عربی]/اسم. [ادبی] نەشە؛ نەشە و گەشە؛ شادی؛ شایی؛ خۆشحاڵی؛ خۆشی.

**نشاط آور** / nešātāvar, našat-/: [عربی/ فارسی] صفت. [ادبی] شادیهێنەر؛ شادیبەخش؛ خەمڕەوێن؛ خەمدەرکەر: **نشاطبخش**

**نشاط انگیز** / nešātangîz, našat-/: [عربی/ فارسی] صفت. [ادبی] شادیهێنەر؛ نەهورێنەر.

**نشاط بخش** / nešātbaxš, našat-/: [عربی/ فارسی] ☜ **نشاط آور**

**نشاکاری** / nešākārî/: [از عربی/ فارسی]/اسم. ۱. کار و ڕەوتی شەتڵ چاندن ۲. ـها/ شەتڵجاڕ؛ زەوینێ کە تێدا شەتڵ چێندراوە.

**نشان**[1] / nešān ، ـها/:/اسم. نیشان؛ نیشانە؛ نیشا: ۱. دروشم؛ ئارم؛ هەوە؛ وێنە یا وێنە و

نووسـراوەیەکی تایبـەتی کـە وەک پێناسـەی ڕێکخراوە یان دەوڵەتێک بە کار دێ ‹نشان اسلام هلال ماه است و نشان مسیحیت صلیب: نیشانـی ئیسلام مانگیلەیـە و نیشانـی مەسیحایەتی خاچ› ۲. نوان؛ شاندەر؛ نیشـاندەر ‹این نشان انسانیت اوست: ئەمە نیشانەی مرۆڤایەتی ئـەوە› ۳. میـداڵ ٤. ناونیشـان؛ شـوێن؛ شـۆنی؛ شـۆن؛ ڕێـنج؛ ئاسەوار؛ شوێنەوار؛ شۆنەما؛ شۆنەمای.

▣ **نشان به آن نشانی**: بەو ناونیشانە؛ نیشان بـەو نیشانە؛ نیشانەی ئەمەیـە؛ بـەو نیشـانەیە؛ پا نیشانییێ ‹نشان به آن نشانی کـه بـاران مـی‌آمد و لباست خیس شـده بـود: بـەو ناونیشـانە کـە بـاران دەباری و جلەکانت تەڕ ببوون›.

▣ **نشان دادن**: نیشان دان؛ نیشان داین؛ شاندان؛ ڕایـدان؛ پیشـان دان؛ شـانی دان؛ ئـەرمانای؛ نیشـــان دەی/ دای: ۱. نوانـــدن؛ نـــاوتش؛ مۆژنایش؛ خستنە بەر چاو ‹از پشت بوتەها بیرون آمد و خودش را نشان داد: لـە پشـت پنچکەکانـەوە هاتەدەر و خۆی نیشان دا› ۲. سەیر و سەرنجی کەسێ بۆ لای شتێک کێشان ‹پرندەی عجیبی را به ما نشان داد: مەلێکی سـەیری پیشـانمان دا› ۳. ڕێنوێنیکردن ‹راه را به ما نشـان داد: ڕێگـەی پێمان نیشان دا› ٤. ڕانان؛ نوانـدن؛ مۆژنـایش؛ ناوتش؛ لە بەر چاو ڕانان ‹فیلم نشـان مـی‌دادنـد: فیلمیان شان دەدا› ٥. بردنە سەیری شتێک و لە بارەیەوە قسەکردن ‹شـهر را بـه آن‌هـا نشـان دادیم: شارمان پێیان نیشان دا›.

**نشان کردن**: نیشان‌کردن؛ دیاری‌کردن؛ کردنە دیاری؛ دیاری‌کەردەی: ۱. کردنە نیشـانە ‹آن درخـت را نشـان کـرده بـودم: ئـەو دارەم کـردبـووە نیشـانە› ۲. کردنــە چــاو؛ هەڵــبژاردن بــۆ مەبەستێک ‹گرگ، گوسفندی را نشـان کـرده بـود: گورگەکە پەزێکی کردبووە چاو›.

**ـ نشان**[۲]: *پیواژە*. ۱. ـــ نیشـان؛ خێـوی دروشمـی تایبەت ‹زرنشان: زێڕنیشان› ۲. ـکوژێن؛ ـدامرێن؛ ـ دامرکێن ‹آتش‌نشـان: ئـاگرکوژێن› ۳. ـــکفـت؛ ـنیشان؛ ـکوت ‹جواهرنشان: گەوهەرکفت›.

**نشاندار** / nešāndār ، ـها/: *صفت*. ۱. دروشمـدار؛ نیشاندار؛ ئارمدار ۲. ناسراو (زۆرتر بە خراپە).

**نشاندن** / nešāndan/: *مصدر. متعدی.* // **نشـاندی**: داتنیشاند؛ **می نشانی**: دادەنیشنی؛ **بنشان**: دانیشنە// ۱. دانیشاندن؛ ڕۆنیشاندن؛ ڕوونشتاندن؛ نیشانن؛ ئەرەنیشـنـەی؛ نیشـنـایرە ‹او را بنشـان روی زمـین: داینیشیە سەر زەوی› ۲. دانیان؛ دانـان؛ نیشـانن؛ نیـایرە ‹خسـتنە سـەر کـار و پلەیـەک ‹بـر تخت پادشـاهی نشـاندن: لـە سـەر تـەختی شـایی دانـان› ۳. خستن؛ نـان؛ ئەنەنیـەی ‹تـوپ را تـوی دروازە نشاندن: تۆپ خستنە نێو دەروازە› ٤. نـان؛ نیـەی؛ نیـای ‹المـاس کـوچکی را روی انگشـتری نشـاند: ئەڵماسـێکی بچـووکی بـە ئەنگوسـتیلەکەوە نـا› ٥. نیـان؛ نـان؛ چانـدن؛ چـانن؛ داچکانـدن؛ داچکیلاندن؛ ناشتن؛ ناژتن؛ نەژراندن؛ چەقاندن؛ چەقانن؛ چەقنای؛ چەقنەی؛ دابنـارتن؛ نیشـانن؛ شتلاندن؛ نیەی؛ نیای ‹درخت نشـاندن: دار نیـان› ٦. دامرکانـــدن؛ داکوژانـــدن؛ کوژاندنـــەوە؛ هەدرانـدن؛ مرنـایرە؛ ئەوەکوشـنـەی؛ کوشـنایوە ‹آتـش را نشـاندن: ئـاگر دامرکانـدن› ۷. خسـتن؛ تووش/ تووشیارکردن ‹مـا را بـه ایـن روز نشـاندند: ئێمەیان خستە ئەم ڕۆژەوە› ۸. *[گفتاری]* ژنێک بۆ لۆکاندن و ئیلاقە ی نارەوا ڕاگرتن * **نشـانیدن**. هەروەها: **نشاندنی**

■ صفت فاعلی: **نشاننده** (دانیشنەر)/ صفت مفعولی: **نشـانده** (دانیشـنراو)/ مصـدر منفـی: **نَنشـاندن** (دانەنیشاندن)

**نشـانده** / nešānde ، ـهـا؛ ـگـان/: *اسم. [گفتـاری]* سووتل؛ سووتلی؛ سوتلێ؛ سویتلی؛ قەپاتمە؛ ئـەو ژنەی بۆ حەز و لۆکاندنی نـارەوا ڕاگیرابـێ ‹چنـد وقتی نشاندەی ارباب بود: ماوەیەک سووتلی ئاغا بوو›.

**نشـانگان** / nešān(e)gān/: *اسم*. نیشـانەگەل: ۱. *[پزشکی]* ئەو نیشانانەی لە نەخۆشیێکدا پێکەوە

سـەر هەڵـدەدەن و نەخۆشـی و بـەرژەنگێ دەناسـێنن ٢. کۆمەڵـە شـتێکی هاوکـات کـە دەبێتە هۆی ناسینەوەی شتێکی تایبەت.

**نشـانگر** / nešāngar ، ـهـا/:/اسم. نیشـاندەر؛ نیشانەک؛ ئامێری نیشان دانی شتێک لـە سـەر پەڕە ‹نشانگر مونیتور: نیشانەکی مونیتۆر›.

**نشـانه** / nešāne ، ـهـا/:/اسم. نیشـانە؛ نیشـانێ: ١. هەڵس‌وکەوت، جووڵە یان حاڵەتێ کە بـیر و بـاوڕ یـان دەسـتوورێک دەردەبـڕێت ‹نشـانەی مخالفت: نیشانەی دژایـەتی› ٢. وێنـە، پیـت یـان تەشـکێ کـە مەبەسـتێک ڕادەگـەیێنێ ‹«؟» نشـانەی پرسـش اسـت: «؟» نیشـانەی پرسـیارە› ٣. ئارم؛ هەوە ٤. کار یان دیاردەیێ کـە هـەواڵ لـە دۆخ و ڕووداوێـک دەدا ‹خمیـازە نشـانەی خواب‌آلودگی است: باوێشـک نیشـانەی خەواڵـوویيە› ٥. شوێنەوارێ کە لە دیاردە یان کارێک بە جـێ دەمێنێ ‹مربا را تو خوردەای، نشانەاش هم لکەی روی پیراهنت است: تۆ مرەباکەت خواردووە و نیشانەکەشی ئـەو پەڵـەیە بـە سـەر کراسـەکەتەوە› ٦. کێلـک؛ ئامانج؛ ئەوەی تیری بۆ دەخەن.

▣ **نشانه‌های اختصاری**: نیشانەی کورتکراوە؛ ئـەو پیـت و نیشـانانەی لـە جێـی سارِسـتە و نـاو دەنووسرێن (وەک «ز» یانی «زایینی»).

▣ **نشانه رفتن** ☜ **نشانه گرفتن**

**نشانه گرفتن**: نیشان‌گرتن؛ کردنە نیشان؛ سێرە هەڵگرتن؛ نیشان لێ‌گرتن؛ نیشـانەوەگێرتەی؛ هشت لێ‌گرتن: **نشانه رفتن**

**نشانه‌شناسی** / nešānešenāsî/:/اسم. نیشانەناسی؛ زانستی ناسین و زانینی مانای نیشـانە و نمانـا و چۆنـاوچۆنی بـە کـار هێنانیـان بەتایبـەت لـە نووسراوەدا.

**نشـانی** / nešānî ، ـهـا/:/اسم. ناونیشـان؛ نـاو و نیشان؛ ناو و نیشانە؛ نیشانی: ١. ئـادرەس؛ ئـەو زانیاریانەی هەواڵ لە جێ‌وشـوێنی کـەس یـان شـتێک دەدا ‹نشـانی خـود را روی پاکـت بنویسـید: ناونیشـانی خۆتـان لـە سـەر پاکەتەکـە بنووسـن› ٢. ئەو زانیاریانەی کەس یان شتێک دەناسـێنن ‹وقتی نشانی دادم مـرا شـناخت: کاتـێ ناونیشانـم دا ناسیمیەوە›.

▣ **نشـانی پسـتی**: ناونیشـانی پۆسـتی؛ ئـەو زانیاریانـەی لـە سـەر هـەناردە پۆسـتیەکان دەنووسرێت (وەک ژمارەی مـاڵ، نـاوی کـۆڵان، شەقام و شار، کۆدی پۆستی یان ژمارەی سندۆقی پۆستی).

**نشانی فرستنده**: ناونیشانی بنێر؛ ناونیشانی ئـەو کەسـەی هـەناردەی پۆسـتی دەنێرێـت. هەروەها: **نشانی گیرنده**

▣ **نشـانی دادن**: ناونیشـان دان؛ نیشـانی دان؛ ناساندن.

**نشانیدن** / nešānîdan/ ☜ **نشاندن**

**نشئه**[1] / naš'e/: [عربی]/اسم. نەشەیی؛ سەرخۆشی؛ سەرخوەشی؛ سەروەشی؛ هەستێکی تایبەت بـە هۆی خواردنی مـاکی خاوکـەرەوە ‹ایـن مـواد در شخص نشئه ایجاد می‌کننـد: ئـەم ماکانـە لـە مرۆڤـدا نەشەیی بەدی دێنن›.

**نشـئه**[2]: صفت. نەشـە؛ سـەرخۆش؛ سـەرخوەش؛ سەروەش ‹وقتی چند پُک زد و نشئه شد صحبتش گل انداخت: کاتێ چەن مژی لێـدا و نەشـە بـوو قسـەی گولی کرد›.

**نشپیل** / našpîl ، ـها☜ **قلاب ١**

**نشـت** / našt/:/اسم. نمتـک؛ دزە؛ ئێـق؛ ڕەوتی وەرڤین؛ وەرفتن؛ دەڵانی نەختەنەختەی شتێک (وەک ئـاو، گـاز، تیشـکی ڕادیۆئـەکتیف و...) لـە دیوارەی شوێنێکی کپ‌کراوەوە. هەروەها: **نشت کردن**

**نشتاب** / naštāb ، ـها/:/اسم. ئاودزە؛ ئاوەزۆ؛ ئـاوی دەڵاو.

**نشتافتن** / našetāftan/ ☜ **شتافتن**

**نشتر** / neštar ، ـها/:/اسم. نشتەر؛ نەشتەر؛ نژتـەر؛ نژ؛ نژد؛ نشتێر؛ نشتەل؛ نێشتەر؛ شفرە؛ کاردێکی

نووک‌تیژ بۆ هەڵدڕینی دمەڵ و برین.
▣ نشتر زدن: نشتەر وەشاندن؛ نەشتەر دان؛ بە نشتەر هەڵدڕین (زۆرتر ئەندامێک).
نشتی [١] / našti ، ـها/:/اسم. دزە؛ نمتک ‹لوله نشتی دارد: لوولەکە دزە دەکا›.
نشتی [٢]: صفت. دەلاو؛ وەرقی؛ نمتکاو؛ دزەکردوو ‹آب نشتی: ئاوی دەلاو›.
نشت یاب / naštyāb ، ـها/:/اسم. نمدۆز؛ کەس یان کەرستەیێ کە شوێنی دزەکردنی شتێک (بەتایبەت ئاوی لووڵ‌کێشی) دەدۆزێتەوە.
هەروەها: **نشت‌یابی**
**نشخوار** / nošxār/:/اسم. کاوێژ؛ کاویژ؛ کاویچ؛ قاویچ؛ قاوێچ؛ قاویش؛ کایی؛ ژا؛ ژاو؛ کائین؛ مشوت؛ کنشت؛ وەکار؛ ڕەوتی جاوینەوەی پەڵخۆر.
▣ **نشخوار کردن**: کاوێژکردن: ١. پۆرساندن؛ کاوینەوە؛ کاوانەوە؛ وەکاریان؛ کایین؛ ڤەکایین؛ جاوینەوەی پەڵخۆر ٢. *[مجازی]* مزەمزکردن؛ ڕیوەڕیو کردن؛ ژاوەژاوکەردەی؛ زۆرپاتە کردنەوەی قسەی بێ‌تام.
**نشخوارکننده** / nošxārkonande ، ـها؛ ـگان/: صفت. کاوێژکەر؛ ڤەکایی؛ تایبەتمەندی دەستەیەک لە گوانداران جووت‌سم (وەک گا، وشتر، ئاسک، پەز، بزن و...) کە ئەوی دەیخۆن نایجاون، قووتی دەدەن و دیسانەوە هەڵیدێننەوە ناو دەم و ئەمجار دەیجاون.
**نشدن** / našodan/ ☜ **شدن**
**نشر** / našr/: [عربی]/اسم. ١. بلاوە؛ پەخش؛ کار و ڕەوتی پەرەدان ‹نشر شایعات: بلاوەی دەنگۆ› ٢. نەشر؛ چاپ و پەخش؛ پیشە و کاری چاپ و پەخش‌کردنی کتێب و بەلاڤۆک ٣. پەخشانگا؛ دەنگاو؛ دامەزراوەی چاپ و پەخش ‹نشر آزادی: پەخشانگای ئازادی›.
**نشریات** / našrîyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **نشریه**
**نشریه** / našrîyye ، ـها؛ نشریات/: [عربی]/اسم. بەلاڤۆک؛ پەخشە؛ بلاڤۆک؛ نووسراوە بۆ چاپ و بلاوکردنەوە (وەک گۆڤار، ڕۆژنامە و...).
▣ **نشریەی ادواری**: بلاڤۆکی دەورەیی؛ بلاڤۆکێ کە لە هەر ماوەیەکی دیاریکراودا (وەک مانگ، وەرز و...) جارێک دەردەچێ.
**نشست** / nešast ، ـها/:/اسم. کۆبوونەوە؛ دانیشتن: ١. کار و ڕەوتی یەک‌گرتنی چەن کەس لە شوێنێکدا بۆ لە سەر چوونی بابەتێکی دیاریکراو ‹در روز دو نشست داشتیم: لە ڕۆژدا دوو کوبوونەوەمان هەبوو› ٢. ڕەوتی نیشتن؛ تەپین؛ نشست‌کردن ‹متوجه نشست دیوار نشد: بە نیشتنی دیوارەکەی نەزانی›.
**نشستن** / našostan/ ☜ **شستن**
**نشستن** / nešastan, nešestan/: مصدر. لازم. // **نشستی**: دانیشتی؛ **می‌نشینی**: دادەنیشی؛ **بنشین**: دانیشە// ١. دانیشتن؛ ڕۆنیشتن؛ نیشتن؛ نشتن؛ نیشتنە خوار؛ نیشتەی؛ نیشتەیرە؛ ڕوونان؛ ڕوونین؛ ڕۆنین؛ داین؛ ڕووی نیشتن؛ نستەن؛ نستەنە؛ نشتش؛ نشتەنە؛ ڤەنشتن: *الف)* قنگ/ قوون دانەوە؛ عنەرەدەی؛ قورسایی لەش خستنە سەر سمت ‹از نشستن خسته شدەام: لە دانیشتن وەڕەز بووم› *ب)* قنگ نانە سەر شتێک ‹روی زمین نشستن: دانیشتنە سەر زەوی› *ج) [ادبی]* پلە و پایەیێک وەرگرتن ‹به تخت پادشاهی نشست: نیشتە سەر تەختی شایی› ٢. نیشتن: *الف)* جێ‌گرتن ‹تیر به قلبش نشست: تیرەکە نیشتە سەر دڵی› *ب)* بەرپەسن بوون؛ خۆش هاتن ‹بە دل نشستن: بە دڵەوە نیشتن› *ج)* ڕووبەرێک داپۆشان ‹برف بە زمین نشسته بود: بەفر نیشتبوو› *د)* هامشۆکردن؛ بەین بوون ‹با آدم‌های ناباب نشستن: دەگەڵ مرۆی نالەبار دانیشتن› *هـ)* بە کارێکەوە پەرژان؛ خەریک بوون ‹پشت فرمان نشستن: نیشتنە پشت فەرمان› ٣. کەوتن؛ تەکان و جووڵە لێبڕان ‹از پای نشستن: لە پێ کەوتن› ٤. نیشتەجێ بوون؛ ژیان ‹در کوچەی ما می‌نشیند: لە کۆڵانی ئێمەدا

نیشته‌جییه› ٥. چاوەڕوان بوون ‹پنج سال به پایش نشست: پێنج ساڵ به دیاریه‌وه دانیشت› ٦. *[مجازی]* دامرکان؛ نیشتنه‌وه؛ داسه‌کنان ‹یک لیوان آب بخور عَطَشت بنشیند: په‌رداخێ ئاو بخۆوه تینوه‌تیت دامرکێ› ٧. ڕاوه‌ستان؛ وێسیان؛ خۆگرتن؛ سه‌برکردن ‹بنشین باران بند بیاید: ڕاوه‌سته باران خۆش بکاته‌وه› ٨. نیشتن؛ چه‌قین؛ تێرۆچوون ‹کشتی به گل نشست: که‌شتیه‌که نیشته قوڕ› ٩. نیشتن؛ تووش بوون؛ تووشیار هاتن ‹به عزا نشستن: نیشتنه پرسه‌وه› ١٠. هاوجێی کردنی ژنی خراپه له‌گه‌ڵ مشته‌ریدا.

■ صفت مفعولی: **نشسته** (دانیشتوو)/ مصدر منفی: **نَنشستن** (دانه‌نیشتن)

**نشستنکی** / nešastanakî/: *قید. [گفتاری]* به دانیشتنه‌وه؛ به دانیشتانه‌وه؛ به نیشتنه‌وه ‹همینطور نشستنکی خوابم برد: هه‌روا به دانیشتنه‌وه خه‌وم لێ که‌وت›.

**نشستنی** / nešastanîî/: *صفت.* نیشته‌نی؛ دانیشتوو؛ تایبه‌تمه‌ندی که‌سێ که بیه‌وێ بمێنێته‌وه و نه‌ڕوا.

**نشست‌وبرخاست** / nešast-o-barxāst ، ـها/: *اسم.* هامشۆ؛ ئامشۆ؛ هامووشۆ؛ هه‌ڵسان و دانیشتن؛ ئه‌ڵس‌بنیش؛ هورز و ئه‌ره‌نیشت؛ هه‌ڵس‌ودانیشت؛ هه‌ڵس‌وبنیشت؛ هه‌ڵس‌وکه‌وت ‹دو بار با آن‌ها نشست‌وبرخاست کنی متوجه می‌شوی: دووجار له‌گه‌ڵیاندا هامشو بکه‌ی تێده‌گه‌ی›.

هه‌روه‌ها: **نشست و برخاست داشتن؛ نشست و برخاست کردن**

**نشسته** / nešaste/: *قید.* به دانیشتنه‌وه؛ به دانیشتانه‌وه؛ ئه‌ره‌نیشته‌ی ‹یاد گرفته بود نشسته بخوابد: فێر ببوو به دانیشتنه بخه‌وێ›.

**نشسته** / našoste/: *صفت.* نه‌شۆراو؛ نه‌شۆردراو؛ ئه‌وه‌نه‌شۆریا؛ نه‌شۆریاگ ‹میوه‌ی نشسته: میوه‌ی نه‌شوراو›.

**نشکافتن** / našekāftan/ ☜ **شکافتن**

**نشکستن** / našekastan/ ☜ **شکستن**

**نشکفتن** / našekoftan/ ☜ **شکفتن**

**نشکن** / naškan ، ـها/: *صفت.* نه‌شکه‌ن؛ خۆگر له به‌رامبه‌ر ته‌وژم و لێکه‌وتنه‌وه.

**نشکیبیدن** / našakîbîdan/ ☜ **شکیبیدن**

**نشگون** / nešgûn/ ☜ **نیشگون**

**نشمردن** / našemordan/ ☜ **شمردن**

**نشمه** / našme ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* ماشۆقه؛ ماشقه؛ ژنێ که ده‌گه‌ڵ پیاوێکدا به دزیه‌وه که‌ین و به‌ینی هه‌یه.

**نشناختن** / našenāxtan/ ☜ **شناختن**

**نشناساندن** / našenāsāndan/ ☜ **شناساندن**

**نشنیدن** / našenidan/ ☜ **شنیدن**

**نشوراندن** / našûrāndan/ ☜ **شوراندن**

**نشوریدن** / našûridan/ ☜ **شوریدن**

**نشو و نما** / našv-o-nemā/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* گه‌شه؛ گه‌شه و نه‌شه؛ هه‌راش؛ فراژێ؛ ڕه‌وتی سه‌ر هه‌ڵدان و به خۆدا هاتن.

**نشیب** / našîb ، ـها/: *اسم. [ادبی]* نشیف؛ نشیو؛ نشێو؛ نشوف؛ شف: ١. سه‌رنجه؛ جێ نزم ٢. سه‌ر به‌ره‌و ژێر؛ لێژ؛ سه‌ر به‌ره ژێر؛ به‌ره‌و خوار؛ لێژایی؛ به‌ره‌وخواری؛ سه‌ره‌وخواری؛ سه‌ربه‌ره‌ژێر؛ سه‌ره‌وچێری؛ شوێنی سه‌ربه‌ره‌خوار.

**نشیمن** / nešîman ، ـها/: *اسم.* ١. نیشمه‌ن؛ نشیمه‌نگا؛ نشینگه: *الف)* جێگه‌ی ڕۆنیشتن *ب)* له‌بار بۆ ژیان ‹اتاق نشیمن: دیوی نشیمه‌ن› ٢. قنگ؛ سمت.

**نشیمنگاه** / nešîmangāh/: *اسم.* ڕوونه‌ک؛ قنگ؛ سمت؛ سمته؛ عنه؛ که‌ماخ؛ سورین؛ کولۆت؛ قالْچه؛ ئه‌و به‌شه له ئه‌ندامی گیاندار (به‌تایبه‌ت مرۆ) که له دانیشتندا ده‌که‌وێته سه‌ر زه‌وی و قورسایی له‌ش ده‌که‌وێته سه‌ری.

**نشین**[1] / nešîn/: *اسم.* ١. کۆم؛ ئاخری ڕێخۆڵه‌ی گه‌وره ٢. زڕتک؛ کووم؛ پند؛ پندرۆ؛ قوڵته‌فسه؛

سوو؛ خرک؛ تریزە؛ باڵوور؛ قیت؛ پیزی؛ کونای قنگ.

**ـ نشین**[2]: *پیواژه.* ـ نشین: ١. ئەوەی لە شوێنێکدا دەژی یا دەمێنێتەوە ‹روستانشین: گوندنشین› ٢. جێگە یان شوێنی مانەوەی کەسێک ‹شاه‌نشین: شانشین›.

**ـ نشینی** / nešînî/: *پیواژه.* ـ نشینی؛ دانیشتن لە شوێنێک ‹شهرنشینی: شارنشینی›.

**نـص** / nas(s)/: [عربی]/اسم. دەق ‹نص قانون: دەقی قانوون›.

**نصاب** / nassāb ، ـها/: [عربی]/اسم. دانەر؛ دامەزرێنەر؛ ئەوەی خەریکی پێکەوەنان و ڕێخستنی کەرستە لە شوێنێکی دیاریکراودایە.

**نصاب** / nesāb/: [عربی]/اسم. ١. ☜ حدّ نصاب، حد ٢. *[ادبی]* وشەدانی هۆنراو بە شیعر.

**نصارا** / nesārā, nasārā/: [عربی]/اسم. *[قدیمی]* فەلان؛ خاچپەرستان؛ مەسیحیگەل.

**نصایح** / nasāyeh/: [عربی] جمعِ ☜ **نصیحت**

**نصب** / nasb/: [عربی]/اسم. کار و ڕەوتی دانان؛ دانیان؛ دامەزراندن: ١. پێکەوەنان و ڕێخستنی شتێ لە شوێنێک. هەروەها: **نصب بودن؛ نصب شدن** ٢. کار و ڕەوتی دەسنیشان‌کردنی کەسێ بۆ کارێک، بەتایبەت پێ‌سپاردنی پلە و پایەیەک ‹نصب فرماندەی نیروی انتظامی: دانانی قوماندەی هێزی ئاسایش›.

**نصرت** / nosrat/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ١. سەرکەوتوویی ٢. یارمەتی؛ یاری؛ یاریدە؛ کۆمەگ.

**نصف**[1] / nesf ، ـها/: [عربی]/اسم. نیوە؛ نیمە؛ نیڤ؛ نیڤی؛ نیمە؛ نسم؛ هەر کام لە دوو بەشی هاوئەندازە لە شتێک ‹نصف من، نصف تو: من نیوە و تۆ نیوە›.

◙ **نصف شب** ☜ **نیمه‌شب**

**نصف**[2]: *صفت.* نیوە؛ دوونیو؛ دووکوت؛ بە یەک ئەندازە دەگەڵ ئەو بەشەکەی تردا ‹نان را نصف کن!: نانەکە نیوەکە!›.

**نصف‌العمر** / nesfol'omr/: [عربی] ☜ **نصفه‌عمر**

**نصف‌النهار** / nesfonnahār/: [عربی]/اسم. ١. جەغزی گرێمانەیی وا کە بە سەر دووجەمسەری زەویدا دەکشێ و ناوەندی هەر ناوەندی زەوینە ٢. نیوە جەغزێک لە نێوان دوو جەمسەری زەویدا ٣. کاری نیشاندانی ئاوا جەغزێک لە سەر نەخشەی گۆی زەوین بە ژمارەوە.

**نصف به نصف** / nesfbenesf/: [عربی/ فارسی/ عربی] *قید.* نیوەبەنیوە؛ نیڤ ـ نیڤ؛ نیمە ـ نیمە؛ نیوە ـ نیوە؛ نیوبەنیو ‹نصف به نصف قسمت می‌کنیم: نیوەبەنیوە بەشی دەکەین›.

**نصفه**[1] / nesfe ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت.* *[گفتاری]* نیڤی؛ نیوە؛ نیمە؛ نسمە: ١. بە نیوە ئەوندەی کە دەیدیرێت ‹این ظرف چرا نصفه است: ئەم دەفرە بۆ نیوەیە› ٢. نیوەچڵ؛ نیوە و ناتەواو ‹کار هنوز نصفه است: کارەکە هێشتا نیوەیە›.

**نصفه‌ـ**[2]: *پیشواژه.* نیوە‌ـ؛ نیمە‌ـ؛ نیڤە‌ـ: ١. بەشێک لە دوو بەشی هاوئەندازە ‹نصفه‌سیب: نیوەسێو› ٢. ناوەڕاستی مەودا و کات ‹نصفه‌راه: نیوەڕێ› ٣. نیوەچڵ؛ نیوە و ناتەواو ‹نصفه‌کاره: نیوەکارە›.

**نصفه‌روز** / nesferûz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* *[گفتاری]* نیوەوەخت؛ نیوەڕۆژە؛ بە کار و تێکۆشانی لە نیوەی ڕۆژدا (بەیانی یان دوای نیوەڕۆ) ‹کار نصفه‌روز؛ مدرسه‌ی نصفه‌روز: ئیشی نیوەوەخت؛ قوتابخانەی نیوەڕۆژە›.

**نصفه‌شب** / nesfešab/: [عربی/ فارسی] ☜ **نیمه‌شب**

**نصفه عمر** / nesfe'omr/: [عربی] *صفت.* نیوەگیان؛ نیوەعومر؛ تووشیاری ترس، پەژارە یان پەرێشانی زۆر بوون ‹از ترس نصفه‌عمر شدم: لە ترسان نیوەگیان بووم›: **نصف‌العمر**

**نصفه‌کاره**[1] / nesfekāre/: [عربی/ فارسی] *صفت.*

ناته‌واو؛ نیوه‌کاره ‹خانه هنوز نصفه‌کاره است: ماڵه‌که هێشتا ناته‌واوه›.

**نصفه‌کاره**[۲]: *قید.* ناته‌واو؛ به ناته‌واوی؛ به نیمه‌کاره‌یی ‹کار را نصفه‌کاره گذاشت و رفت: کاره‌که‌ی ناته‌واو جێ هێشت و ڕۆی›.

**نصفه نیمه** / nesfenîme/: [عربی/ فارسی] *صفت. [گفتاری]* نیوه و ناته‌واو؛ که‌ل و کوته‌ر؛ نیوه‌چڵ.

**نصفی** / nesfî/: [عربی] *قید. [گفتاری]* له‌تێک؛ کوتێک؛ نیوه‌یه‌ک ‹یکی و نصفی؛ نصفی نان برداشتم: دانه و له‌تێک؛ کوتێک نانم هه‌ڵگرت›.

**نصیب** / nasîb ، ـها/: [عربی] *اسم.* به‌ش؛ بێش؛ به‌شه؛ نسیب؛ نسیو؛ واش؛ وه‌ش؛ پش؛ بیه‌ش؛ به‌ری؛ گیهه‌ڤ؛ هۆخ؛ ئه‌وی له به‌ش‌کردنه‌وه‌دا به‌ر که‌سێ ده‌که‌وێ.

◙ **یا نصیب و یا قسمت**: یا عومر؛ هه‌یهوو؛ تازه کوا ‹کی بشود دوباره شما را ببینیم؟ یا نصیب و یا قسمت: یا عومر تا دیسان چاومان به ئێوه بکه‌وێته‌وه›.

◙ **نصیب بردن**: به‌ش بردن؛ به‌شدار بوون ‹من از آن پول نصیبی نبردم: ئه‌من له‌و پاره‌یه به‌شێکم نه‌برد›.

**نصیب شدن**: لێ‌که‌وتن؛ پێ‌گه‌یشتن؛ پێ‌بڕان؛ (وه)به‌رکه‌وتن ‹بیشترش نصیب تو شد: زۆربه‌ی له تۆ که‌وت›.

**نصیب کردن**: به‌ش دان؛ پێ‌دان؛ به‌شدار کردن.

**نصیحت** / nasîhat ، ـها؛ نصایح/: [عربی] *اسم.* ئامۆژگاری؛ ئامۆچیاری؛ مۆچیاری؛ مۆژگاری؛ مۆجگاری؛ مۆج؛ په‌ند؛ قسه‌یه‌ک که بۆ تێگه‌یاندن، وریا کردنه‌وه یان ڕێنوێنی که‌سێک، پێی ده‌گوترێ.

◙ **نصیحت کردن**: ئامۆژگاری/ مۆچیاری‌کردن.

**نضج** / nozc/: [عربی] *اسم.* ڕه‌وتی پاگرتن؛ خۆ گرتن؛ به‌رز بوونه‌وه؛ به‌ره‌و سه‌ر ڕۆیشتن.

**نطربوق** /natarbûq/ ☜ **نَتَربوق**

**نطفه** / notfe ، ـها/: [عربی] *اسم.* توو؛ تۆم؛ تۆمه؛ تۆو: ۱. سیللولی جنسی نێر ۲. *[گفتاری]* سیللولی به‌دیهاتوو له سیللولی نێر و مێ.

**نطق** / notq/: [عربی] *اسم.* ۱. وتاربێژی؛ گۆتار ۲. *[گفتاری]* قسه؛ قسێ؛ قسیه؛ په‌یڤ؛ وته؛ گوته.

◙ نطق کردن: دوان: ۱. وتار دان؛ قسه بۆ کۆڕێ کردن ۲. *[تعریض]* فه‌رمایش‌کردن؛ قسه‌ی زۆر و نابه‌جێ‌کردن.

نطق کسی باز شدن: که‌سێک هاتنه قسه؛ ده‌م که‌سێ کریانه‌وه؛ زوانی که‌سێ به‌ر بوون.

نطق کسی کور شدن: *[مجازی]* زمانی که‌سێ گیران/ به‌سیان؛ ده‌م که‌سێک قوڵف بوون؛ که‌سێ له قسه‌که‌وتن.

**نطق** / notoq/: [از عربی] *اسم. [گفتاری]* قسه؛ قسیه؛ وته؛ گوته؛ په‌یڤ: **نتق**

◙ نطق زدن/ کشیدن: ده‌م‌کردنه‌وه؛ لێو بزواندن؛ هه‌ناسه‌دان؛ قسه‌کردن ‹کسی جرأت نداشت نطق بزند: که‌س نه‌ده‌وێرا ده‌م بکاته‌وه›.

**نطلبیدن** / natalabîdan/: [فارسی/ عربی/ فارسی] ☜ **طلبیدن**

**نظائر** / naz'āer/: [عربی] ☜ **نظایر**

**نظار** / nozzār/: [عربی] جمعِ ☜ **ناظِر**

**نظارت** / nezārat, nazārat ، ـها/: [عربی] *اسم.* چاوه‌دێری؛ چاودێری؛ چاویاری؛ چاڤدێری؛ پایین؛ به‌ردایین؛ کار و ڕه‌وتی پێڕاگه‌یشتن، پرسینه‌وه و چاو لێ‌کردن بۆ دڵنیایی له باش به‌ڕێوه چوونی کارێک. هه‌روه‌ها: **نظارت داشتن؛ نظارت شدن؛ نظارت کردن**

◙ نظارت استصوابی: چاودێری له ڕاست و ڕه‌وا بوونی کار.

**نظاره** / nezāre, nazāre/: [عربی] *اسم.* سه‌یر؛ ته‌مه‌شا؛ تماشا؛ نیگا؛ مه‌یزه؛ کاری ڕوانین؛ چاو لێ‌کردن ‹از ایوان خانه‌اش باغ را نظاره می‌کرد: له به‌رهێوانی ماڵه‌که‌یه‌وه سه‌یری باخه‌که‌ی ده‌کرد›.

**نظاره‌گر** / nezāregar, nazāre- ، ـها؛ ـان/:

[عربی/ فارسی]/اسم. بینەر؛ وێنەر؛ سەیرکەر؛ تەماشاچی.

**نظافت** / nezāfat, nazāfat/: [عربی]/اسم. پاکی؛ پاکژی؛ تەمیسی؛ خاوێنی.

▣ نظافت کردن: خاوێن‌کردنەوە؛ تەمیس‌کردن.

**نظافتچی** / nezāfatî, nazāfat-، ـها؛ ـان/: [عربی/ ترکی]/اسم. کەسێ کە خاوێن‌کردنەوەی شوێنێ، بەتایبەت دامەزراوەیەکی لە ئەستۆدایە.

**نظام** / nezām، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ۱. پێکهاتە؛ دوزەنە؛ سەرجەمی قانوون، داب و دەستوور و نەریتی پێکهێنەری دەزگایەک ‹نظام پزشکی؛ نظام طبیعت: پێکهاتەی بژیشکی؛ دوزەنەی سروشت› ۲. دوزەنە؛ کۆندام؛ سەرجەمی دام و دەزگای رامیاری و کۆمەلایەتی ‹نظام سرمایەداری: دوزەنەی سەرمایەداری› ۳. رژیم؛ دوزەنە؛ دام و دەزگای حوکمەتی ‹نظام جمهوری: رژیمی کۆماری› ٤. ئەرتەش؛ سەرجەمی سپای ولاتێک.

▣ نظام وظیفە: ۱. خزمەتی سەربازی ۲. مەزرینگەی کۆکردنەوە و ناردنی لاوان بۆ سەربازی.

**نظامنامە** / nezāmnāme، ـها/: [عربی/ فارسی] اسم. دەستووری حوکمەتی؛ قانوون و بڕیاری داندراو لە لایەن بەرپرسانی حکوومەتەوە کە پێویستە بەڕێوە بچێ.

**نظامی**[1] / nezāmî، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. ئەرتەشی؛ سپایی؛ قۆشەنی؛ نیزامی؛ کەسێ کە لە ئەرتەشدا کار دەکا.

**نظامی**[2]: صفت. چەکداری؛ ئەرتەشی؛ سەر بە هێزی چەکداری ‹لباس نظامی: بەرگی چەکداری›.

**نظامیگری** / nezāmîgarî/: [عربی/ فارسی] ☜ **میلیتاریسم**

**نظایر** / nazāyer/: [عربی] جمعِ ☜ **نظیر: نظائر**

**نظر** / nazar، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. نیگا؛ نیا؛ تواشا؛ تەماشا ‹یک نظر دیدمش: تاقە نیگایەک دیتم› ۲. را؛ بیر و را؛ راوێژ؛ تەگبیر ‹نظر تو در این بارە چیست؟: رای تۆ لەم بارەوە چیە؟› ۳. ویست؛ خوازە؛ خواست؛ رەوتی گەرەک بوون ‹در نظر داشت خانەای بخرد: گەرەکی بوو مالێک بسێنێ› ٤. بیر؛ ویر؛ هزر ‹بە نظرم رسید: بە بیرمدا هات› ٥. /أنظار/ پێش‌چاو؛ بەرچاو؛ بەرچاوان ‹از نظر افتادن؛ نظر کسی را گرفتن: لە پێش‌چاو سووک بوون؛ بەرچاو کەسێ گرتن› ٦. بار؛ لایەن؛ سۆنگە ‹از نظر سیاسی: لە باری رامیاریەوە›.

▣ نظر بد: ۱. چاوی پیس؛ چاو خراو ۲. دلی پیس؛ دلی رەش.

نظر بە راست: */نظامی/* شێوە راوەستانێک کە سەر بە لای راستدا گەڕابێ. هەروەها: **نظربەچپ**

▣ نظر انداختن: چاو (پێدا) خشاندن؛ سەرسەری و بێ‌ورد بوونەوە لێ‌ڕوانین ‹یک نظر بە این مقالە بنداز!: چاوێک بەم وتارەدا بخشێنە!›.

نظر دادن: بیر و رای خۆ دەربڕین.

نظر داشتن: ۱. چاو/ دل لە دوو بوون ۲. بەمراز بوون ۳. لە سەر بڕوایەک بوون.

نظر کردن: ۱. سەیرکردن؛ تەمەشا کردن ۲. ورد بوونەوە ۳. چاو لێدان؛ کردنە چاوەوە.

نظر کسی را جلب کردن: چاو کەسێ گرتن؛ سەرنجی کەسێک ڕاکێشان.

نظر کسی را گرفتن: چاوی کەسێک گرتن؛ سەرنجی کەسێ ڕاکێشان.

از نظر کسی افتادن: لە پێش چاوی کەسێک سووک بوون؛ لە بەرچاو کەسێک کەفتن.

از نظر گذراندن: ۱. چاو لێ‌کردن؛ سەیرکردن ۲. چاو پێدا خشاندن.

بە نظر آمدن/ رسیدن: ۱. کەوتنە بەر چاو؛ دیتران؛ هاتنە پێش چاو ۲. وا دیار بوون.

تحت نظر بودن ☜ تحت نظر، **تحت**

**نظرآزمایی** / nazarāz(e)māyî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. راوێژ؛ رازموونی؛ پرس و را لە خاوەن رایان لەمەڕ بابەتێکەوە.

**نظربازی** / nazarbâzî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. چاوبازی؛ قۆقی: ۱. بە چاو ئەویـنداری کـردن؛ چاو لێـک کـردنی دوو دڵـدار ۲. چاولـەوەڕێنی؛ چاوچرێنی؛ چاوچەرێنی؛ سەیری لەشی جنسـی تر بۆ کەیف و خۆشی.

**نظربلنـد** / nazarboland/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **بلندنظر**

**نظرتنـگ** / nazartang/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **تنگ‌نظر**

**نظرتنگـی** / nazartangî/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **تنگ‌نظری**

**نظرخواهی** / nazarxâhî ، ـها/: [عربـی/ فارسـی] /اسم. ڕاخوازی؛ پرسیار لە بیر و ڕای خەڵک یـان تاقمێکی تایبەت لەمەڕ شتێکەوە.

**نظرسـنجی** / nazarsancî ، ـها/: [عربـی/ فارسـی] /اسم. ڕائەزمونی؛ ڕازمونی؛ تۆژینەوە لە سەر بیر و ڕای خەڵـک یـان تـاقمێکی تایبـەت لەمـەڕ شتێکەوە.

**نظرقربانی** / nazarqorbânî ، ـها/: [عربـی]/اسم. چاوەزار؛ دۆعای چاوزار؛ مۆروو یـان نوشـتەیەک کە بۆ بەرگری لە چاوی پیس لـە ملـی منداڵـی دەکەن یان بە کراسیەوە هەڵدەواسن.

**نظرگاه** / nazargâh ، ـها/: [عربـی/ فارسـی]/اسم. ڕوانگە: ۱. بەرچاوگـە؛ بەرژەوەنـد؛ بەرجـەوەن؛ دیامان ۲. بیر و ڕا؛ بڕوا.

**نظرگیـر** / nazargîr/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. سەرنجڕاکێش.

**نظری** / nazarî/: [عربی] صفت. هـزری؛ ویـری: ۱. تایبەتمەندی هونەر یان زانستێک کە بناغەی لە سەر باری بیرکردنەوە و تێڕامانە تا تاقیکـاری ‹فیزیـک نظری؛ موسیقی نظری: فیزیـک هـزری؛ مووسیقای هزری› ۲. خاوەن باری زەینی ‹بررسی نظری: تـاوتوێ کـردنی هـزری› ۳. *[گفتـاری]* بـەگومان؛ سۆسـەیی ‹نظری حرفی زد: بـەگومان قسەیەکی کرد›.

**نظریـات** / nazarîyyât/: [از عربـی] جمـع ☜ **نظریّه**

**نظریـه** / nazarîyye ، ـها؛ نظریات/: [عربـی]/اسم. ۱. بیرۆکـە؛ لـێدوانێـک بـە دانسـتە بـۆ ڕوون کردنەوەی نهێنیەکی زانستی یان مەبەسـتێکی بـیرەوانی ۲. بیرۆکـە؛ کـڕ و کاشـی هێنـدێک دیاردە لە باری پێوەندیان پێکەوە ۳. بڕوا، ڕوانگە یان شێوازێ کە وەک بناغەیەک هەڵدەبژێردرێ و ئاراستە دەکرێ ✽ **نگرە**

▣ نظریەی مهبانگ ☜ **مهبانگ**

**نظریـەپـرداز** / nazarîyyepardâz ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. بیرۆکوان؛ بیرۆکەوان؛ دانەری بیرۆکە. هەروەها: **نظریەپردازی**

**نظم** / nazm/: [عربی]/اسم. ۱. تەکووزی؛ مرێسی؛ ڕێـکوپێکـی ‹کارهـا بـا نظـم کامـل پـیش مـی‌رود: کارەکـان بـە تەکووزیـەکی تـەواوەوە بـەرەو پـێش دەچـن› ۲. دامـەزراوی؛ هـێمنی؛ بـار و دۆخـی بەبێ ئـاژاوە و بشـێوە ۳. /ـها/ هـۆنراوە؛ هۆنـە؛ شیعر؛ گوتە و نووسراوەی بە کێش و قافیە.

**نظمیه** / nazmîyye ، ـها/: [عربـی]/اسم. *[قدیمی]* شارەوانی؛ شارەبانی؛ کەلانتەری.

**نظیر** / nazîr ، ـها؛ نظایر/:[عربی] /اسم. هاوتا؛ ئاوتـا؛ ئامتا؛ لنگە.

**نظیف** / nazîf/: [عربی] صفت. *[ادبی]* پاکژ؛ پـاک؛ خاوێن؛ پاقژ؛ پوختە؛ بێ‌گەرد؛ بێ‌خـەوش؛ پـوار؛ پێک؛ تەمیس ‹با یک پارچـەی نظیـف ببندیـد: بـە پارچەیەکی پاکژ بیبەستن›.

**نعـره** / na're ، ـها/: [عربـی]/اسـم. نەعرەتـە؛ نەعرەتێ؛ نەعرە؛ نارەتـە؛ نـەڕە؛ نـەڕڕە؛ هـەلان؛ گورە؛ گوڕڕە؛ دەنگی بەرز و گڕی بێ‌واتا کـە زۆر جار لە سۆنگەی تووڕەیی، ژان یان بـۆ هەڕەشـە دەردێت، بەتایبـەت هـاواری گیانـدارانی دڕنـدە ‹نعرەی شیر: نەعرەتەی شێر›.

▣ نعـره زدن/ کشـیدن: گرمانـدن؛ هـاڕەکردن؛ گـوڕان؛ گوڕانـدن؛ نەڕانـدن؛ نـەڕان؛ نـەڕانن؛

هرمزاندن؛ هرمژین؛ توممین؛ نەڕەی؛ نـەڕای؛ نەعرەتە پێکەی.

**نعرەزنان** / na'rezanān/: [عربی/ فارسی] *قید*. بـە نەڕڕەوە؛ نەڕەنەڕ؛ گورەگوڕ؛ بـە نەعرەتـەوە؛ بـە گوڕاندنەوە ‹شیر نعرەزنان حملە کرد: شێر بە نـەڕەوە هەڵمەتی دا›.

**نعش** / na'š ، ـها/: [عربی]/*سم*. تاقـێر؛ جـەنازە؛ تەرم؛ لاشـە؛ لاک؛ کـەلاش؛ کەلـەخ؛ کەلـەش؛ جەندەک؛ بەلاتە؛ کەلاک؛ جەسـتەی گیانـداری مردوو.

**نعش‌کش** / na'škeš ، ـهـا/: [عربی/ فارسی]/*سم*. لاشـــەکێش؛ لاک‌کـــێش: ١. جـــەنازەکێش؛ کەرستەی مردووگوێزتنەوە ٢. کەسێ کە لاشەی مردوو بە سەر شانەوە دەگرێ و دەیبـا بـۆ سـەر قەبران.

**نعش‌کشی** / na'škešî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*سم*. *[تعریض]* لاشەکێشی؛ کاری جەنازە کێشان.

**نعل** / na'l ، ـهـا/: [عربی]/*سم*. نـاڵ؛ نالـە؛ نـاڵ: ١. لەتە ئاسنی وەک کەوان کـە دەیکوتنـە ژێـر سمی چارەوێ و ولاخدا ٢. ناڵچە؛ نالەکی؛ نالی کـەوش؛ مێخـی سـەر پـان و تـەخت‌کـراو کـە دەیدەنە ژێر پاژنەی کەوشدا.

▣ **نعل کردن**: ناڵ‌کردن؛ نالێ‌کەردەی؛ یەک‌سم ناڵ کردن.

**نعـل وارونـە زدن**: *[مجـازی]* شـــوێنەگومکێ کردن؛ پێچەوانەی نیازی دڵ نواندن، بۆ فریـو دان.

**نعـل‌اسـبی** / na'l(e)'asbî/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **نعلی**

**نعلبکی** / nalbakî, na'lbakî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. نالـبەکی؛ ژێرئیسـکان؛ ژێرپیاڵـە؛ نالـەکی؛ نالـــووکی؛ تـەپلک؛ دەردەنـگ؛ تەبلـــە؛ تابلـــە؛ بن‌پیاڵە؛ گەبۆل؛ بن‌بادە؛ گالش؛ دەفرە چکۆڵەی زۆرتر لە چینی بۆ ژێرئیسکان و فنجان.

**نعلبند** / na'lband ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسـی]/*اسم*. سـۆڵبەند؛ نالــبەند؛ نالــبەن؛ نالــوەن؛ نالقــەن؛ قەڵەمتراش؛ سم‌تراش؛ کەسێ کە یەکسـم نـاڵ دەکا.

**نعلبنـــدی** / na'lbandî/: [عربـی/ فارسـی]/*اسم*. ناڵبەندی: ١. کاری ناڵ‌کردن ٢. پیشەی ناڵبەن ٣. /ـها/ کارگەی ناڵبەن.

**نعلی** / na'lî/: [عربی] *صفت*. نالـین؛ نالـی؛ وەک ناڵ ‹ماهیچەی نعلی: ماسوولکەی نالی›: **نعل اسبی**

**نعلین** / na'leyn ، ـها/: [عربی] *سم*. نالـک؛ نـالێن؛ کالە؛ سۆل؛ قاپقاپ؛ کەوشی سووک و بێ‌پاژنە.

**نعمات** / na'amāt/: [عربی] جمعِ ☜ **نِعمَت**

**نعمت** / ne'mat ، ـها؛ نعمات/: [عربـی]/*اسم*. بـەش؛ نیعمـــەت: ١. شـــتێکی بـــاش کـــە لـــە لایـــەن کەســـێکی مـــەزن، بەتایبـــەت خـــواوە خـــەلات دەکـرێ ٢. ئـەوەی دەبێتـە هـۆی هـێمنی و ئارخـــەیانی ٣. تایبەتمەنـــدی و دانســـتەیەکی بەرچاو لە کەسێکدا ‹نعمت زیبایی: بەشی جوانی›.

**نعمت‌اللهی** / ne'matollāhî/: [عربی] ☜ **نِعمَتی**

**نعمتی**[1] / ne'matî ، ـها/: [عربی]/*سم*. نیعمـەتی؛ هـەر یەکـە لـە شـوێنکەوتووانی تەریقـەتی شـا نیعمەتووڵلاهی وەلی (ـ ۸۳٤ کۆچی): **نعمتی**

**نعمتی**[2]: *صفت*. نیعمەتی؛ بەندیوار بـە تەریقـەتی شا نیعمەتوڵلاهی وەلیەوە.

**نعنـا** / na'nā ، ـهـا؛ ـیـان/: [از عربـی]/*سم*. نـەعنا؛ نەعنـە؛ نـەناباخی؛ هێـزا؛ بوودینـە؛ گیایـەکی گەلاوردی تام‌تیژی بۆنخۆشە، وشـک دەکـرێ و بۆ تام بۆ دە چێشتی دەکەن: **نعناع**

▣ **نعنـــای کـــوهی/ صـــحرایی**: پوونگەکێویلـــە؛ پوونگـەڕێوی؛ تهتـاوک؛ تهتاڤـک؛ تەهتاڤـک؛ تەتاڤـک؛ نەعنەکێویلکـە؛ جـاترە؛ ڕووەکێکـی کێـوی و خۆڕسـکە، گـەلاکانی بـۆنی نـەعنا ئەدەن: **نعناع کوهی/ صحرایی**

**نعنـــاداغ** / na'nādāq/: [از عربـی/ فارسـی]/*اسم*. نەعناداخ؛ نەعنای وشکەوەکراو کە دە نێـو ڕۆنی چۆقـاوی دەکـەن و وەک تـام لەگـەڵ بـڕێ

چێشتدا دەیخۆن.

**نعناع** / na'nā'/: [عربی] ☜ **نعنا**

▣ نعنای کوهی/ صحرایی ☜ **نعناع کوهی صحرایی**

**نعوذبالله** / na'ûzobellāh/: [عربی] دعا. نەعوزوبیللا: ١. پەنابەخوا ٢. خوانەکەردە؛ خوای نەکەردە؛ خوانەکردوو.

**نعوظ** / no'ûz, nu'ûz/: [عربی]/اسم. ڕەقی؛ ڕەپی؛ بەلی؛ قیتی؛ دۆخی ڕەق بوون؛ ڕەپ بیەی؛ ڕەق و ڕاست بوونی ئەندامێک کە پێشتر شل بووە، بەتایبەت ئەندامی نێرینە.

**نغریدن** / naqorrîdan/ ☜ **غریدن**

**نغز** / naqz/: صفت. [ادبی] ١. دڵخواز؛ دڵگر؛ دلنشین؛ خۆش؛ وەش ٢. باش؛ چاک؛ قەنج؛ عال؛ نووک ٣. ڕێکوپێک؛ تەکووز ٤. جوان؛ زێوا؛ قەشەنگ ٥. تەڕ و بەڕ؛ پاراو.

**نغلتاندن** / naqaltāndan/ ☜ **غلتاندن**

**نغلتیدن** / naqaltîdan/ ☜ **غلتیدن**

**نغمات** / naqamāt/: [عربی] جمعِ ☜ **نغمه**

**نغمه** / naqme، ـها؛ نَغَمات/: [عربی]/اسم. نەوا؛ ئاواز؛ نەغمە؛ دەنگ: ١. سۆزە؛ دەنگی هاوکێش و خۆش ٢. ئاهەنگ؛ نەوای مووسیقا بەتایبەت دیلان ٣. گۆرانی؛ ستران؛ کۆت؛ زار؛ کزە.

**نغمه‌خوان** / naqmexān، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. گۆرانیبێژ؛ دەنگبێژ؛ سترانبێژ؛ گۆرانیواچ؛ گۆرانیچڕ. هەروەها: **نغمه‌خوانی**

**نغمه‌سرا** / naqmesarā، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی]/اسم. گۆرانیوان؛ سترانڤان: ١. سترانهۆن؛ ئەوەی ئاهەنگی گۆرانی دەهۆنێتەوە ٢. گۆرانیبێژ؛ سترانبێژ؛ چڕگەر؛ ئەوەی گۆرانی دەخوێنێ.

**نغمه‌سرایی** / naqmesaryî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. سترانڤانی؛ گۆرانیوانی: ١. کار و ڕەوتی دانانی ئاهەنگی مووسیقا ٢. کاری خوێندنی گۆرانی.

**نفاخ** / naffāz/: [عربی] صفت. بادار؛ وادار؛ بە تایبەتمەندی با دروستکردن لە نێو ڕیخۆڵەدا.

**نفاس** / nefās/: [عربی]/اسم. ١. زایمان؛ زان؛ زای؛ زا؛ زەها؛ زۆمە؛ زایەنە ٢. بلیمانە؛ بلیمان؛ بریوان؛ خوێنێ کە لە کاتی منداڵ بووندا دەڕژێ.

**نفاست** / nefāsat, nafāsat/: [عربی]/اسم. گرانکێشی؛ گرانباییەتی؛ دۆخ یا چۆنیەتی نرخدار بوون.

**نفاق** / nefāq/: [عربی]/اسم. دووبەرەکی؛ لنجی؛ ناڕێکی؛ دووبەندی؛ دووپلێ: ١. دووڕوویی؛ بار و دۆخی هاودڵ و هاودەنگ نەبوون ‹نفاق ورزیدن: دووڕوویی کردن› ٢. ـها/ دژایەتی لە بیر و ڕادا ‹نفاق افکندن: دووبەرەکی نانەوە›.

▣ نفاق افتادن: دووبەرەکی کەوتن/ داکەوتن.

نفاق افکندن/ انداختن: دووبەرەکی نانەوە/ خستن/ داخستن.

نفاق ورزیدن: دووڕوویی کردن.

**نفاق‌افکن** / nefāq'afkan، ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. گێرەشێوێن؛ دووبەرەکیداخەر.

**نفاق‌افکنی** / nefāq'afkanî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. گێرەشێوێنی؛ کارەڕەهاتی دووبەرەکی داخستن.

**نفت** / naft/:/اسم. نەفت؛ نەوت؛ نەوتە: ١. تراوێکی خەستی بۆگەنە بە ڕەنگی قاوەیی تۆخ لە ژێر زەویدا، بریتی لە تێکەڵاوی چەند هیدرۆکەربون وەک هیگزان، هیپتان، ئوکتان و ماکی ئالیتر کە لە پاڵاوتنی زۆر شتی جۆراوجۆر بەرهەم دێ: **نفت خام** ٢. نەوتی سپی؛ نەوتی چرا: **نفت چراغ؛ نفت سفید**

▣ نفت چراغ ☜ **نفت ـ٢**

نفت خام ☜ **نفت ـ١**

نفت سفید ☜ **نفت ـ٢**

نفت سیاه: نەوتەڕەشە؛ مازووت؛ نەوتە سیاوێ.

نفت گاز: گازۆییل.

**نفت‌آلود** / naftālûd/: صفت. نەوتینە؛ نەوتاوی؛ نەفتاوی؛ بە نەوتەوە تلاو.

نفتالین / naftālîn/: [فرانسوی]/اسم. نەفتالین؛ بلۆرێکی سپی بۆن‌تیژە لە بەرێکەوە گازی ژەهراوی لێ دەبێتەوە و دژی مێروو بەتایبەت مۆردە و لە پیشەسازیشدا بە کار دەچێ.

نفتخیز / naftxîz/: صفت. نەوتی؛ نەفتی؛ نەوتدار؛ نەوتەوەر؛ خاوەن بەرهەمی نەوتی ‹سرزمین نفتخیز: ولاتی نەوتی›.

نفت‌سوز / naftsûz/: صفت. نەفتی؛ نەفتین؛ نەوتی؛ نەوتین؛ بە تایبەتمەندی کارکردن بە نەوت ‹بخاری نفت‌سوز: سۆبەی نەوتی›.

نفتکش / naftkeš، ـها/: اسم. نەوتبەر؛ نەوتکێش؛ کەرستەی گواستنەوە، تایبەتی ڕاگوێزانی نەوت ‹کشتی نفتکش: گەمیەی نەوتبەر›.

نفتگر / naftgar، ـان/: اسم. نەوتکار؛ ئەوەی لە سەنعەتی نەوتدا کار دەکا ‹نفتگران ایران جمعیت بزرگی را تشکیل می‌دهند: نەوتکارانی ئێران جەماوەرێکی زۆر پێک دێنن›.

نفتی ¹ / naftî، ـها/: اسم. [گفتاری] نەوتی؛ نەفتی:
۱. نەوتفرۆش؛ نەفتفرۆش؛ نەوتوەرش
۲. نەوتفرۆشی؛ فرۆشگای نەوت.

نفتی ²: صفت. نەوتی؛ نەفتی: ۱. سەر بە نەوت ‹درآمدهای نفتی: داهاتە نەوتییەکان› ۲. تایبەتمەندی ئەوەی بە نەوت کار دەکا ۳. نەوتاوی؛ نەوتین؛ بە نەوتەوە تلاو ‹دستم نفتی شد: دەستم نەوتاوی بوو›.

نفخ / nafx/: [عربی]/اسم. ۱. با؛ وا؛ بای سک؛ بایێ کە لە نێو کۆندامی هەرسەکدا دروست دەبێ ۲. با؛ وا؛ پەرچەوت؛ خەمەرە؛ ئاوسانی ورگ و ژان و پێچ پێداهاتنی بە هۆی بای سکەوە ۳. کار و ڕەوتی دەماندن؛ تێتووڕاندن؛ دەمنەی.

▣ نفخ داشتن: با هەبوون ‹شکمش نفخ دارد: ورگی بای هەیە›.

نفخ کردن: با کردن؛ وا کەردەی ‹بعد از خوردن شیر شکمش نفخ می‌کرد: دوای خواردنی شیر سکی بای دەکرد›.

نفخ‌آور / nafxāvar/: [عربی/ فارسی] صفت. واکەر؛ بادار؛ بە تایبەتمەندی بەدیهێنانی با دەنێو زگدا.

نفر / nafar، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. ـات/ کەس؛ نەفەر؛ یەکەی ژماردنی مرۆڤ ۲. سەر؛ یەکەی ژماردنی وشتر ‹چهار نفر شتر: چوار سەر وشتر› ۳. ـات/[نظامی] سەرباز؛ کەسی چەکدار.

نفرات / nafarāt/: [از عربی]/اسم. ۱. کەسان؛ کەسێ؛ کەسگەل؛ کەسەیل؛ کەسێل ۲. سەربازان؛ چەکدارانی بێ‌نیشان.

نفربر / nafarbar، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. نەفەربەر؛ کەرستەی گواستنەوەی سەرباز.

نفرت / nefrat، ـها/: [عربی]/اسم. قین؛ ڕق؛ ڕک؛ گرخ؛ بار و دۆخی پێ‌خۆش نەبوون و بێزار بوون لە کەس یان شتێک.

▣ نفرت داشتن: قین/ ڕق لێ‌بوون؛ بێزار بیەی؛ خوەش نەهاتن؛ حەز لێ نەکردن ‹از پیاز نفرت دارم: قینمە لە پیاز›.

نفرت کردن: قین هەستان/ هەڵسان؛ بێزار بوون؛ قین هاتن.

نفرت‌آور / nefratāvar/: [عربی/ فارسی] ☜ نفرت‌انگیز

نفرت‌انگیز / nefratangîz/: [عربی/ فارسی] صفت. قین‌هەڵسێن؛ وەڕەزکەر؛ بێزارکەر.

نفرستادن / naferestādan/ ☜ فرستادن

نفرمودن / nafarmûdan/ ☜ فرمودن

نفروختن / nafurûxtan, naf(o)rûxtan/ ☜ فروختن

ـ نفره / nafare/: [عربی/ فارسی] پیواژە. ـ نەفەرە؛ ـکەسە؛ ـکەسی؛ سەر بە ئەژماری کەسان ‹یک‌نفره؛ دو نفره: یەک‌نەفەرە؛ دووکەسە›.

نفری ¹ / nafarî/: [عربی] صفت. کەسی؛ نەفەری؛ پێوەندیدار بە ژمارەی کەسانەوە ‹اتاق دو نفری: ژووری دوو کەسی›.

نفری ²: قید. ۱. کەسی؛ قۆڵی؛ بە شێوەی

ژمارەی کەسان ‹دو نفری مبل را بلند کردند: دوو کەسی موبلەکەیان هەڵگرت؛ سێ نفری رفتیم: سێ قولی ڕۆیشتین› ٢. سەرەو؛ سەروو؛ هەر کەس؛ هەر کەسە؛ یۆ؛ یەکێ؛ یەکێک ‹باید نفری صد هزار تومان بپردازید: دەبێ سەرەو سەد هەزار تمەن بدەن›.

**نفریت / nefrît/:** [فرانسوی]/اسم. ١. /پزشکی/ هەر جۆرە نەخۆشی پێوەندیدار بە هەوکردنی گورچیلەوە ٢. /کانی‌شناسی/ جۆرێکی هەرزانبایی لە یەشم بە ڕەنگی سپی تا سەوزی تۆخ.

**نفریدن / nafrîdan/:** مصدر. متعدی. /قدیمی/ ڕتان؛ ڕتاندن؛ تووک کردن؛ تووک لێکردن؛ سنگ لێکوتان؛ پێهەڵکالان؛ دۆعای شەڕ/ خراپ کردن.

**نفریفتن / nafarîftan/** ☜ **فریفتن**

**نفرین / nefrîn** ، ـها/: اسم. تووک؛ زۆتی؛ نفرە؛ نفر؛ پشۆر؛ نەفرین؛ نفرین؛ نفرینی؛ لەکۆلەڕۆ؛ ڕت؛ ئاهـ ونزووڵە؛ نەوز؛ نووەڕ؛ نوڕ؛ دۆعای شەڕ.

▣ نفرین شدن: تووک لێ‌کران ‹این خانه نفرین شده است: ئەم خانووە تووکی لێ‌کراوە›.

نفرین کردن: دۆعا کردن؛ ڕتاندن؛ تووک لێ‌کردن؛ سنگ لێ‌کوتان؛ نووەڕکردن؛ نفرین کرن ‹مادرتان او را نفرین کرد: دایکتان دۆعای کرد›.

نفرین کسی گرفتن: دۆعای کەسێ گیرا بوون؛ نزای کەسێ گرتن ‹نفرین او ما را هم می‌گیرد: دوعای ئەو لە ئێمەش گیرا دەبێ›.

**نفس / nafas** ، ـها/: [عربی]/اسم. هەناسە؛ هناسە؛ هەناسکە؛ هناس؛ نەفەس؛ نەفەسە؛ ئنە؛ نەز؛ نز؛ فز؛ بین؛ بهن؛ بینگ؛ بهین؛ پشوو؛ پشی؛ پەتۆ: ١. / انفاس/ هلم؛ بایێ کە لە ناو دەم و سیپەلاکدا دێ و دەچێ ‹نفست را نگهدار!: هەناسەت ڕاگرە!› ٢. ڕەوت یان چۆنیەتی هەناسە دان ‹نفس بکش!: هەناسە بدە!› ٣. هەوایەک کە لە دەمەوە دێت ‹نفس او بوی الکل می‌داد: هەناسەی بۆنی ئەلکولی دەدا› ٤. /کنایی/ کاتێکی زۆرکەم؛ دەم؛ سات؛ ئان؛ گاف ‹یک نفس هم صبر نکرد: یەک هەناسەش ڕانەوەستا› ٥. /مجازی/ ژین؛ ژیان ‹نفس کسی را بریدن: هەناسەی کەسێک برین› ٦. شوێنەواری هاونشینی ‹نفس مبارک: هەناسەی پیرۆز› ٧. /مجازی/ هێز و برست ‹از نفس افتادن: لە هەناسە کەوتن›.

▣ نفس گرم: /مجازی/ قسەی گەرم؛ وتەی هیوابەخش و دڵگر.

تا آخرین نفس: تا دوایین هەناسە؛ تا دما هەناسە؛ تا ئاویلکە دان؛ هەتا مردن؛ تا مەردەی؛ نوقتکا پەیەن.

▣ نفس آخر را کشیدن: دوا هەناسە دان؛ لە گیانەلادا بوون؛ گیان‌لاو بوون؛ نقتک/ نوقتکا پەیەن بوون.

نفس از خود بر بدن: فزە نەکردن؛ دەنگ لێ‌نەهاتن؛ کپ و بێدەنگ بوون.

نفس از ماتحت (کون) کشیدن: /مجازی، گفتاری/ لە قنەوە هەناسەکێشان؛ لە ژێرەوە هەناسە دان؛ دواکاتەکانی ژیان دانە سەر.

نفس به شماره افتادن: ١. کەوتنە هەناسەبرکێ؛ لە بەر کزی و نەخۆشی دژوار نەفەس کێشان ٢. کەوتنە گیان دان؛ نزیک بە مردن بوون.

نفس تازه کردن: پشوو دان؛ نەفەس دان؛ هەناسە تازەکردنەوە؛ شەکەتی دەرکردن؛ وچان دان ‹نگذاشت لااقل نفسی تازه کند: نەیهێشت لانی‌کەم پشوویەک بدا›.

نفس خود را حبس کردن: هەناسە خواردنەوە؛ پشوو وێستاندن؛ بین گێرتەیوە؛ هەناسەی خۆ ڕاگرتن.

نفس خود را دزدیدن: بە دزیەوە هەناسە دان؛ زۆر هێواش و بێدەنگ هەناسەکێشان.

نفس داشتن: ١. مان؛ زیندوو بوون؛ هەناسە/ گیان تێدابوون؛ زینە بیەی؛ مەنەی؛ گیان تیابوون ‹تا نفس داشت نگذاشت خانه را بفروشند: تا

مابوو نەیهێشت ماڵەکە بفرۆشن› ٢. *[کنایی]* هێز تێدابوون؛ هەناسە هەبوون؛ هەناسە مان؛ وزە مان؛ گوڕ تێدا مان؛ هێز و توانا هەبوون ‹تا نفس داشتم کار کردم: هەتا هێزم تێدابوو، کارم کرد›.

نفس زدن: هەناسە دان: ١. هەناسەکێشان ٢. پەیتا پەیتا و لە سەر یەک هەناسە هەڵکێشان.

نفس کسی از جای گرم در آمدن: *[مجازی]* دەنگی کەسێک لە جێی گەرمەوە هەڵسان/ دەرهاتن؛ جێگەی کەسێ نەرم بوون؛ کەسێ تێر بوون ‹پولم کجا بود؟ پیداست نفست از جای گرم درمی‌آید: پوولم لە کوێ بوو؟ دیارە دەنگت لە جێی گەرمەوە هەڵدەستێ›.

نفس کسی بریدن/ بند آمدن: هەناسەی کەسێ بڕیان؛ کەوتنە هەناسەبڕکێ؛ هێز تێدا نەمان ‹تا بە آن بالا رسیدم نفسم برید: تا گەیشتمە ئەو سەرە، هەناسەم بڕا›.

نفس کسی خوردن: *[مجازی]* کەوتنە بەر هەناسەی کەسێک؛ ژێر کارتێکەری کەسێک کەوتن ‹پیداست کە نفس دایی جان بە تو هم خوردە کە این طور می‌گویی: دیارە تۆش کەوتوویەتە بەر هەناسەی خاڵەگیان کە وا ئێژی›.

نفس کسی در سینە حبس شدن: هەناسەی کەسێک (لە سنگیەوە) نەهاتنە دەر؛ بۆ ماوەیەک هەناسە لە سینگدا مانەوە.

نفس کسی درنیامدن: هەناسە نەدان: ١. نووکە/ نکە/ فزە لە کەسەوە نەهاتن؛ نق نەکردن؛ سرتە نەکردن؛ وزەو یۆی بەر نامەی ‹وقتی حرف می‌زد نفس کسی درنمی‌آمد: کاتێ قسەی دەکرد، کەس هەناسەی نەدەدا› ٢. نەفەس نەکێشان.

نفس کسی را بریدن: *[کنایی]* نەفەسی کەسێک بڕین: ١. کوشتنی کەسێک ٢. نق/ نکە/ نووکە/ فزە لە کەسێک بڕین؛ دەنگی کەسێک بڕین؛ کەسێک بێ‌دەنگ و خوسپ کردن.

نفس کسی گرفتن: هەناسەی کەسێک گیران؛ هەناسەو یۆی تنەوە بیەی؛ هەنکیان؛ هەناکیای ‹نفسم می‌گیرد، کە هوا هم اینجا زندانیست: هەناسەم دەگیرێ، لێرە هەواش وەک من زیندانیە›.

نفس کشیدن: هەناسە دان؛ نەفەس‌کێشان؛ هلکشاندن؛ ڤەدان؛ هەناسە دەی؛ بینی دای؛ بین‌کێشان؛ هەڵکێشانی هەوا بۆ نێو سی و دانە دەرەوەی.

نفس کشیدن از یاد کسی رفتن: *[مجازی]* هەناسە دان لە بیر کەسێک چوونەوە؛ مردن ‹کاری می‌کنم کە نفس کشیدن از یادش برود: وا دەکەم هەناسە دانی لە بیر بچێتەوە›.

از نفس افتادن: لە هەناسە کەوتن؛ نەفەس چنیان؛ هێز و توان لە دەست دان ‹آن‌قدر دوید کە از نفس افتاد: هێندە هەڵات لە هەناسە کەوت›.

بە نفس ـ نفس افتادن: کەوتنە هەسکەهەسک؛ هەناسە سوار بوون؛ هەنکیان؛ هەناکیەی؛ هەناکیای؛ زۆر ماندوو بوون؛ هلچایش؛ وەستیان ‹دیگر بە نفس ـ نفس افتادە بود: ئیدی کەتبووە هەسکەهەسک›.

نفس / nafs ، ـها؛ نفوس؛ آنفاس؛ آنفُس/: *اسم.* نەفس: ١. خۆ؛ خود؛ زات؛ هێم ‹نفس کار غلط است، کاری بە نتیجەاش ندارم: کارەکە خوی هەڵەیە، کارم بە ئاکامیەوە نیە› ٢. *[قدیمی]* ڕەوان؛ گیان؛ گیون؛ کۆمەڵەی هێزی هەستی و جمشتی گیاندار ٣. چالاکی دەروون ‹نفس امّارە: نەفسی ئەممارە›.

◻ نفس امارە: نەفسی ئەممارە؛ خواستی دەروون بۆ پێکهێنانی حەز، خۆشی و چێژ.

نفس لوّامە: نەفسی لەووامە؛ نەفسی لۆمەکەر؛ خواستی دەروونی بۆ هەڵگەڕاندنەوەی مرۆڤ لە کاری خراپ و دزێو.

نفس مطمئنە: نەفسی موتمەئینە؛ دەروونی هێمن و دڵنیا، بە دوور لە ئاژاولە و بلبشێوی.

نفس ناطقه: هێزی ئاخاوتن.

**نفسانی** / nafsānî/: [عربی] *صفت.* نەفسانی ‹خواهش‌های نفسانی: داخوازگەلی نەفسانی›.

**نفس‌پرستی** / nafsparastî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* نەفس‌پەرستی؛ هلچایش؛ هۆگری بە حەز و چێژەی لەش.

**نفس‌تنگی** / nafastangî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* *[گفتاری]* هەناسەبڕکێ؛ هەناسەبڕی؛ هەنسکەبڕکێ؛ هەناسەتەنگی؛ نەفەس‌تەنگی؛ پشووسواری؛ هەناسەبڕکە؛ هەناسەبڕی؛ هەناسکەبڕکێ: ١. بەرهەنگ؛ ئاسم ٢. هەناسەسواری؛ ڕەوتی دژوار هەناسە دان.

**نفس‌زنان** / nafaszanān/:[عربی/ فارسی] *قید.* هەناک ـ هەناک؛ هەسکەهەسک؛ هەسەهەس؛ خنەخن؛ خیشەخیش؛ بە هەناسەبڕکێ؛ بە پشووسواریەوە.

**نفس‌کش** / nafaskeš/: [عربی/ فارسی] *اسم.* *[گفتاری]* جووقەوار؛ بوونەوەر؛ گیاندار.

▣ نفس‌کش طلبیدن: نەفەس‌کێش خواستن؛ پیاو/ کوڕ ویستن؛ شارلاتانی و چەقۆکێشی کردن.

**نفس‌گیر** / nafasgîr/: [عربی/ فارسی] *صفت.* نەفەس‌بڕ؛ نەفەس‌گیر؛ نەفەس‌چن: ١. خەف؛ کەش و هەوایەکی ناحەز کە بەر بە هەناسە دان دەگرێ ٢. *[مجازی]* تەنگ‌لێ‌هەڵچن؛ دەرەتان‌بڕ؛ دژوار و وەڕەزکەر ٣. زۆر سەیر و سەمەرە و بە سام کە هەناسە لە سینگدا قەتیس دەکا.

**نفشردن** / nafešordan/ ☜ **فشردن**

**نفع** / naf'/ ، ـها/: [عربی] *اسم.* قازانج؛ قەزانج؛ هاقڵ؛ هەو؛ سوو؛ کەڵک؛ نەفعە؛ بەهرە ‹نفع در این است که آنجا را بخری: قازانج لەمەدایە کە ئەوێ بکڕی›.

▣ نفع شخصی: قازانجی تاکەکەسی؛ قازانجێ کە تەنیا بۆ کەسەکە خۆێ بێت و بەس.

**نفع‌طلب** / naf'talab ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* قازانج‌خواز؛ قازانجەکی؛ چاو لە دووی هەل و قازانج.

**نفقات** / nafaqāt/: [عربی] جمعِ ☜ **نفقه**

**نفقه** / nafaqe ، ـها؛ نفقات/: [عربی] *اسم.* ١. خەرجی؛ بژیو ٢. *[فقه]* بژیوی پێویست بۆ ژیانی ژن و منداڵ.

**نفله** / nefle/: *صفت.* *[گفتاری]* ١. فەوتاو؛ نەماو؛ تێداچوو؛ لەبەین‌چوو ٢. *[تعریض]* بێ‌دەس؛ بێ‌دەست؛ دەسەپاچە.

▣ نفله کردن: ١. فەوتاندن؛ فەوکاندن؛ دانەبا؛ تێدا بردن؛ تیا بردن؛ فەوتنەی؛ فوو دەی؛ ناسەی؛ نەهێشتن ‹هر چه از پدرش مانده بود همه را در عرض یک سال نفله کرد: هەر چی لە بابی بەجێ مابوو هەمووی لە یەک ساڵدا فەوتاند› ٢. کوشتن؛ کوشتەی؛ لە نێو بردن. هەروەها: **نفله شدن**

**نفوذ** / nufûz, nofûz/: [عربی] *اسم.* ١. ڕەخنە؛ دزە؛ کار و ڕەوتی تێڕۆچوونی نەختە ـ نەختە و نادیار بە شوێنێکدا ‹آب به خانه نفوذ کرده بود: ئاو دزەی کردبووە نێو ماڵەکەوە› ٢. ڕەخنە؛ کار و ڕەوتی خۆ تێ‌خزاندن بۆ ناو تاقم و دەستەیەک بە مەبەستێکی نهێنی ‹مأموران به داخل حزب نفوذ کرده بودند: ڕاسپاردەکان خۆیان خزاندبووە نێو حیزبەوە› ٣. ڕەخنە؛ کاری بە دزیەوە یان بە زۆر چوونە شوێنێک ‹توانستند به شهر نفوذ کنند: توانیان ڕەخنە بکەنە ناو شارەوە› ٤. بڕشت؛ دەسەڵات؛ دەسڕۆیی؛ کەڵێژ؛ ڕەوتی شوێن دانان بەبێ زۆر و گوشار ‹از نفوذ خودش برای ایجاد وحدت استفاده کرد: لە بڕستی خۆی بۆ پێکهێنانی یەکێتی کەڵکی وەرگرت› ٥. بڕشت؛ هێزی مەعنەوی یان ئاکاری بەرز و کاریگەر ‹بر روی همکارانش نفوذ زیادی دارد: بە سەر هاوکارانیدا بڕشتی زۆرە›. هەروەها: **نفوذ داشتن؛ نفوذ کردن**

**نفوذی** / nufûzî, nofûzî ، ـها/: [عربی] *اسم.* سیخوڕ؛ پاپی؛ ڕەخنەیی؛ ئەوەی بە فێڵ و درۆ

خۆی ده نێو کۆمەڵێکی نەیار خزاندووە ‹یکی از همین نفوذی‌های ساواک همه را لو داد: یەکێ لەم سیخورە ساواکیانە، هەمووی دا بە دەستەوە›.

**نفـوس** / nufûs, nofûs/: [عربی]/اسم. ۱. جمع **نَفس** ☜ ۲. جەماوەر؛ ئاپۆرە؛ جڤات؛ جوات؛ گەل؛ حەشامات؛ پسات؛ نوفووس؛ نفووسە ‹آمار نفوس و مسکن: هەژماری جەماوەر و خانووبەرە›.

▣ نفوس بد زدن: [فرهنگ مردم] قراندن؛ قرانن؛ قرنەی؛ قرنگاندن؛ نوخشانەی خراپ لێدان؛ بەراوردی خراپ‌کردن ‹نفوس بد نزن! خواب دیدم پسرت صحیح و سالم برگشته است: مەدقرێنە! خەوم بینی کورەکەت ساغ و سەلامەت هاتۆتەوە›.

**نفهم** / nafahm/: [فارسی/ عربی] صفت. [گفتاری] گەوج؛ نەفام؛ لاژگ؛ لاژک؛ لاژی؛ سەروشک؛ نەزان؛ تێنەگەیشتوو؛ گەلحۆ؛ دەبەنگ؛ تەفک؛ کەمشۆ؛ گەواڵ؛ گەوەز؛ حەپۆل؛ بێئاوەز؛ گێلۆکە؛ گۆهپان؛ خەشیم؛ ئەنەنەیاوا؛ گوهماکەر ‹مگر می‌شود آدم این‌قدر نفهم باشد: مەگین دەبێ مرۆ هێندە گەوج بێ›.

**نفهمانـدن** / nafahmāndan/: [فارسی/ عربی/ فارسی] ☜ **فهماندن**

**نفهمـی** / nafahmî ، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. [گفتاری] نەفامی؛ نەزانی؛ گەوجی؛ لاژگی؛ گێژی؛ گێجی؛ دەبەنگی؛ کەلهویی؛ تەفکی؛ حەپۆلی؛ بێئاوەزی؛ بەیقەشەیی.

▣ خود را به نفهمی زدن: [گفتاری] خۆ لە کەری دان؛ خۆ دان لە دەبەنگی ‹نمی‌دانم نمی‌فهمید یا خودش را به نفهمی زده بود: نازانم تێنەدەگەیشت یان خۆی لە کەری دابوو›.

**نفهمیدن** / nafahmîdan/: [فارسی/ عربی/ فارسی] ☜ **فهمیدن**

**نفی** / nafy/: [عربی]/اسم. [ادبی] حاشا؛ ماندەڵ؛ کار و ڕەوتی پێ بە سەردا ساوین؛ دانە ژێر ڕاستەقینەیەکدا.

▣ نفـی بلـد: [قـدیمی] کـار یـا ڕەوتی دوور خستنەوە؛ تاراندن؛ ڕەواندن؛ شەلپاندن.

▣ نفی کردن: نانە ژێر پا؛ حاشا کردن؛ پێ بە سەردا ساوین؛ ماندەڵ‌کردن ‹خودت حرف خودت را نفی می‌کنی: بۆ خۆت قسەکەی خۆت نەنییە ژێر پا›.

**نفیا** / nafyan/: [عربی] قید. بە نە؛ بە شێوە یا بە باری دانە ژێردا ‹نفیا یا اثباتاً جوابی بده!: بە نە یان ئەرێ وەلامێک بدەوە!›.

**نفیـر** / nafîr ، ـها/: اسم. ۱. هاوار؛ زەنا؛ فریا؛ دەنگی بەرزی تێکەڵ بە ئاه و نالە ۲. [موسیقی] کەلەشاخ؛ نەفر؛ سازێکی کەونارا لە شاخی کەڵ کە بۆ هەواڵ بە یەکتر دان کەڵکیان لێوەردەگرت ۳. [قدیمی] ئاواز؛ هەوا؛ دەنگ.

**نفیس** / nafîs ، ـها/: [عربی] صفت. گرانبایی؛ هێژا؛ بەنرخ ‹جایزەی نفیس: خەڵاتی گرانبایی›.

**نـق** / neq/: اسم. [گفتاری] گازە؛ پرتە؛ بۆڵە؛ چووکە؛ لاکایا؛ گلە و گازندەی لە بەر خۆوە.

▣ نق زدن: بۆلاندن؛ بڵماندن؛ پرتاندن؛ پرتە و بۆڵەکردن؛ گازەکردن؛ بۆڵەبۆڵ‌کردن؛ خوتە کردن؛ پرتەپرت‌کردن؛ چووکەچووک‌کردن؛ چووکەکردن؛ چووکنەی؛ چووکنای؛ بۆڵنای؛ بلمەبڵم‌کردن؛ ڕنگەڕنگ‌کردن؛ ورتە و پرتە کردن دە بن لێوانەوە بە تووڕەیی ‹دیدم نق می‌زند، کرایه‌اش را بیشتر کردم: دیتم دەبولێنێ، کرێکەم بۆ زیاد کرد›.

**نقائص** / naqā'es/: [عربی] ☜ **نقایص**

**نقـاب** / neqāb ، ـها/: [عربی]/اسم. دەمامک؛ ڕووبەند؛ ڕووبەن؛ لەچک؛ بەردەم؛ ڕووپۆش؛ دەمهەڵبەست؛ دەمەڵبەس؛ دەمهەڵپێچ: ۱. کەرستەیەک لە پارچە، مقەبا یان شتیتر کە دەم و چاوی پێدەگرن تا نەناسرێنەوە ۲. پارچەیەک کە ژنان بە سەر و چاوی خۆیاندا دەدەن.

▣ نقاب/ ماسک از چهرەی کسی برداشتن ☜ **نقاب/ ماسک کسی را دریدن**

**نقاب زدن**: لەچک‌کردن؛ دەمامک دان؛ دەم و لووت بە دەمامک بەستن.

**نقاب / ماسک کسی را دریدن**: *[کنایی]* پەتی کەسێ خستنە سەر ئاو؛ دۆز و دەغەلی کاری کەسێک ئاشکرا کردن؛ فێڵ و تەڵەکەی کەسێ دەرخستن: **نقاب/ ماسک از چهرەی کسی برداشتن**. هەروەها: **نقاب/ ماسک از چهرەی کسی کنار رفتن**

**نقاد** / naqqād ، ـان/: [عربی]/اسم. ڕەخنەگر؛ ئەوەی شتێک هەڵدەسەنگێنێ و چاکە و خراپەی دەخاتە بەرچاو.

**نقادی** / naqqādî/: [عربی]/اسم. ڕەخنەگری؛ کار و ڕەوتی هەڵسەنگاندن و نرخاندنی شتێک و خراپە و چاکەی خستە بەر چاو.

**نقار** / neqār ، ـها/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* زویری؛ زیزی؛ ئازراوی؛ دڵئێشاوی؛ ڕەنجاوی؛ گەهراوی.

**نقارە** / naqqāre, naqāre ، ـها/: [عربی]/اسم. نەقارە؛ سازێکی زەربی بە دوو دەهۆڵی گەورە و پچووکەوە کە بە یەک کەس لێ‌دەدرێ.

**نقارەخانە** / naqqārexāne, naqāre- ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. نەقارەخانە؛ جێگەی دۆڵ و نەقارە لێدان.

**نقاش**/ naqqāš/: [عربی]/اسم. نەققاش: ١. *[نجوم]* وێنەیەکی ئاسمانی لە سەر جەمسەری باشوور ٢. /ـها؛ ـان/ نیگارڤان؛ شێوەکار؛ وێنەکێش؛ شێوەکێش؛ نیگارکێش ٣. /ـها/ ڕەنگ‌کار؛ بۆیەچی؛ ئەو کەسە دەر و دیواری ماڵ ڕەنگ دەکا ٤. /ـها/ کەسێ کە ڕووبەری ماشین، پاش سافکاری ڕەنگ دەکا.

**نقاشی** / naqqāšî/: [عربی]/اسم. شێوەکاری؛ نەققاشی: ١. /ـها/ شێوە؛ نیگار؛ وێنە؛ ئەوی بە دەست کێشراوە ٢. نیگارکێشی؛ نگارین؛ هونەری نواندن و هێنانە بەرچاوی شتێک لە سەر پەڕەیەک بە قەڵەم و ڕەنگ ٣. ڕەنگ‌کاری؛ کاری داپۆشانی ڕووبەرێک بە توێژی ڕەنگ. هەروەها: **نقاشی کردن**

▣ نقاشی متحرک: کارتۆن؛ فیلمێک لە زنجیرە شێوەی لە دووی یەک کە چیرۆکێ دەگێڕێتەوە.

**نقاط** / noqāt, neqāt/: [عربی] جمعِ ☜ **نقطه**

**نقال** / naqqāl ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. شایەر؛ بەیت‌بێژ؛ حەکایەت‌بێژ؛ حەکایەت‌خوان؛ چیرۆکڤان، بەتایبەت ئەوەی لە شوێنی گشتی (وەک قاوەخانە) نەقڵ و چیرۆک دەگێڕێتەوە.

**نقالە** / naqqāle ، ـها/: [عربی]/اسم. نەقالە: ١. نیوەجەغزێکی پلەکدارە بۆ ئەندازە گرتن و کێشانی سووچ ٢. کەرستەیەکی میکانیکی بۆ گواستنەوەی باری شفتە، بە تەسمە یان زنجیر.

**نقالی** / naqqālî/: [عربی]/اسم. شایەری؛ بەیت‌بێژی؛ چیرۆکڤانی؛ حەکایەت‌خوانی: ١. کار و پیشەی شایەر ٢. /ـها/ کاری نەقڵ و چیرۆک گێڕانەوە.

**نقاهت** / neqāhat, naqāhat/: [عربی]/اسم. ١. سەردەمی تازە لە نەخۆشی هەستانەوە ٢. *[کنایی]* سووکە نەخۆشی.

**نقایص** / naqāyes/: [عربی] جمعِ ☜ **نقیصە: نقائص**

**نقب** / naqb ، ـها/: [عربی]/اسم. نهون؛ لوهین؛ لوغم؛ لەغەم؛ لەغم؛ نەغم؛ نەغەم؛ لەغەر؛ ڕەهەند؛ بن‌بیف؛ تەمباف؛ چەپکەن؛ قمیش؛ دالان یان بوارگەی لە ژێر زەوینەوە.

▣ نقب زدن: قمیش کێشان؛ ڕەهەند لێدان؛ تەمباف‌کرن؛ چەپکەن‌کردن.

**نقب‌زن** / naqbzan ، ـها/: [عربی/ فارسی] *صفت*. لەغمکەن؛ ڕەهەندکەن؛ قمیش‌کێش؛ خۆگرتوو یان لێهاتوو لە زەوی کۆڵیندا (وەک مشک و کەرویشک).

**نقد**[1] / naqd ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. نەخت؛ نەغد؛ پارەی لە بەردەست و ئامادە بۆ خەرج‌کردن

‹ببین نقد چقدر داریم: بزانە نەخت چەندمان پێیە›
٢. ڕەخنە؛ بەژاقیت؛ بەژاقیت ‹نقد کتاب: ڕەخنەی کتێب› ٣. نەخت؛ نەغد؛ جۆرێ مامەڵە کە پارەکەی دەسبەجێ دەدرێ. بەرانبەر: **نسیه**
٤. نەختینە؛ پارەی لە بەردەست.
▣ نقد کردن: ١. نەختکردنەوە؛ کردنە پووڵ ٢. ڕەخنەگرتن؛ هەڵسەنگاندن. هەروەها: **نقد شدن**
**نقد**[٢]: *صفت.* وشک؛ نەخت؛ نەغد؛ ئامادەی دانوسان ‹پول نقد: پارەی وشک›.
**نقد**[٣]: *قید.* نەخت؛ نەغد: ١. دەس بە نەخت؛ بە شێوەی ئامادەی دان و وەرگرتن ‹پولش را نقد می‌دهم: پارەکەی نەخت دەدەم› ٢. بە شێوەی دەسبەجێ و بێقەرز و قۆڵە ‹نقد می‌فروخت: نەخت دەیفرۆشت› ٣. پووڵی؛ دراوی؛ بە شێوەی دراوی باوی وڵات ‹چک می‌دهی یا نقد می‌خری؟: بە چەک دەیدەی یان نەخت دەیسێنی؟›.
▣ نقد خریدن: نەغد/ نەخت کڕین؛ دەسبەجێ پارەی سنراوە دان. هەروەها: **نقد فروختن**
نقد دادن: نەخت دان؛ بە نەغد فرۆشتن؛ دەسبەجێ پارەی فرۆشراوە وەرگرتن.
**نقدا** / naqdan/: [عربی] *قید.* ١. نەخت؛ نەغد؛ بە نەغدی؛ دەسبەدەس؛ دەستبەدەست ‹نقدا پرداخت شد: نەخت درا› ٢. *[گفتاری]* جارێ؛ جارێک؛ جارێکان؛ جارێکانێ؛ جارێو ‹نقدا بنشین شامت را بخور! بعد ببینیم چه می‌خواهی: جارێ دانیشە شێوەکەت بخۆ! ئانجا بزانین چت دەوێ›.
**نقده** / naqade ، ـها/: [از عربی] *اسم.* شریتەی لە گولابتوون کە جلوبەرگی پێ دەڕازێنن.
**نقده‌دوزی** / naqadedûzî/: [از عربی/ فارسی] *اسم.* کاری دوورینی شریتەی گولابتوونی بە سەر جلوبەرگدا بۆ جوانی.
**نقدی**[١] / naqdî/: [عربی] *صفت.* *[گفتاری]* نەخت؛ نەغدی؛ دەستی.
**نقدی**[٢]: *قید.* *[گفتاری]* نەخت؛ بە نەغدی؛ نەخت و پوخت.
**نقدینگی** / naqdînegî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* نەختینەیی؛ نەغدینەیی؛ دارایی؛ سەرجەمی پارە و دراوی باوی وڵات لە دەزگایەکی ئابووریدا ‹افزایش نقدینگی کشور: هەڵکشانی نەختینەیی وڵات›.
**نقدینه** / naqdîne ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* دراو؛ دراف؛ پارەی نەغد؛ نەختیە؛ پارەی باوی وڵات کە دان و ستانی پێ دەکرێ.
**نقر** / naqr/: *اسم.* *[ادبی]* کار و ڕەوتی کۆڵین؛ کەندن؛ هەڵکەندن؛ ڕەوێشتن (بە سەر بەردەوە)؛ هەڵکەندنی نووسراو یان وێنە بە سەر شتێکەوە. هەروەها: **نقر شدن؛ نقر کردن**
**نقرس** / neqres/: [عربی] *اسم.* جۆرێک نەخۆشی سووت و سازی لەشە کە ڕێژەی ئەسیدئووریکی خوێن هەڵدەچێ و جومگەکان بە هۆی نیشتنی ئەسیدئووریک تووشی هەو و ژان دەبن.
**نقره** / noqre/: [از سغدی] *اسم.* زێو؛ زیو؛ زیف؛ تورمە؛ نوقرە: ١. توخمی کیمیایی کانزایی بە ژمارە ئەتۆمی ٤٧ و کێشی ئەتۆمی ١٠٧,٨٦، سپی و بریقەدار، چەماندنی و چەکوشخۆر، لە ناو ئەسید نیتریک و ئەسید سولفووریکی داخدا دەتوێتەوە و لە جەواهیرسازی، ددانبژیشکی، دەواسازی و وێنەگریدا زۆر بە کەڵکە ٢. /ـها؛ ـجات؛ ـآلات/ بەرهەمی لە زێو چێکراو.
▣ نقرەی آلمانی: زێوی ئەڵمانی؛ ئالیاژی مس و ڕۆح و نیکل.
نقرەی سکه: زێوی سکە/ دراو؛ ئالیاژی جۆراوجۆری زێو، لە ٥٠ تا ٨٩٪ زێو و باقیەکەی مس یان مس و نیکل.
نقرەی نیکلی: وەرشۆ؛ وەرشەو.
**نقره‌آبی**[١] / noqre'ābî/: [از سغدی/ فارسی] *اسم.* نوقراوی؛ ڕەنگی زێوی ئاماڵ ئاوی.
**نقره‌آبی**[٢]: *صفت.* نوقراوی؛ بە ڕەنگی زێوی ئاماڵ شین.

**نقره‌ای** [1] / noqre'î/: [از سغدی]/اسم. زێوی؛ نوقره‌یی؛ ڕەنگی بۆری مەیلەو سپی بە بریقەی کانزاییەوە.

**نقره‌ای** [2]: صفت. زێوی؛ نوقرەیی؛ زیوی: ۱. زێوین؛ زیوین؛ چێ‌کراو لە زیو ۲. بە ڕەنگی زێو.

**نقره‌داغ** / noqredāq/: [از سغدی/ فارسی]/اسم. [مجازی] ۱. ئازار و ئەشکەنجەی زۆر سەخت ۲. پارەی بە ناڕەوا سنراو کە دەبێتە هۆی زیز بوونی پارەدەرەکە.

▣ نقره‌داغ کردن: ۱. داخ‌کردن؛ زەجرەوە دان ‹چرا نعره می‌زنی؟ مگر نقره‌داغت کرده‌اند؟!: بۆ دەنەڕێنی؟ مەگین داخیان کردووی؟!› ۲. بە زۆر تەڵەکە کردن؛ زۆر لێ‌کردن بۆ دانی پارەی بە ناحەق.

**نقره‌فام** / noqrefām/: [از سغدی/ فارسی] صفت. [ادبی] زێوی؛ نوقرەیی؛ زیوکارە؛ زیوپات؛ زێوپات.

**نقره‌کار** / noqrekār، ـها؛ ـان/: [از سغدی/ فارسی] اسم. زێوکار؛ نوقرەکار: ۱. ئەو کەسەی دەفر و ئامان لە زێو دروست دەکا ۲. ئەو شتە لە زێو دروست کراوە.

**نقره‌کاری** / noqrekārî/: [از سغدی/ فارسی]/اسم. زێوکاری؛ نوقرەکاری: ۱. کار و پیشەی زێوکار ۲. ـها/ کارگای زێوکاری ۳. ـها/ هونەری ڕازاندنەوە و خەملاندنی شت یا شوێنێک بە زێو.

**نقره‌گون** / noqregûn/: [از سغدی/ فارسی] صفت. [ادبی] زیوی؛ زێوکار؛ زێوپات؛ بە ڕەنگی نوقرە.

**نقش** / naqš/: [عربی]/اسم. ۱. ـها؛ نقوش/ نەخش؛ نەقش؛ وێنە؛ شێوە؛ مەوژ؛ نتل؛ تووق؛ زجێف ‹نقش شیر: نەخشی شێر› ۲. نەخش؛ ڕۆڵ؛ هەر کام لە کەسایەتیەکانی نێو شانۆ یان فیلم کە شانۆیار دەوری دەگێڕێت ۳. دەور؛ کارکرد ‹شریعتی در پیروزی انقلاب نقش بزرگی داشت: شەریعەتی لە سەرکەوتنی شۆڕشدا دەورێکی بالای هەبوو›.

▣ نقش برجسته ☜ **نقش‌برجسته**

نقش تمبر: نەخشی تەمر؛ نەخشێک لە سەر مۆر، کە دایرەی پۆست لە جیاتی تەمر بە پاکەتیەوە دەنێ و پارەکەی دەستێنێ.

▣ نقش بازی کردن: ۱. [کنایی] مەرایی کردن؛ ڕواڵەت نیشان دان؛ کایەکلێ‌کردن ۲. نەخش کایەکردن؛ دەورگێڕان ‹آرام در نقش امیرارسلان بازی می‌کرد: ئارام لە نەخشی ئەمیرئەرسەلاندا کایەی دەکرد›.

نقش بر آب شدن: [مجازی] با بردن؛ بە دەم باوە چوون؛ درانە با؛ بە باوە چوون؛ دریەی ئاویەرە: ۱. تێدا/ تیا چوون ‹امیدهایش نقش بر آب شد: هەموو ئاواتەکانی با بردنی› ۲. بەتاڵ بوونەوە ‹هر تلاشی کە کردم نقش بر آب شد: هەر هەوڵێکم دا بە دەم باوە چوو›.

نقش بستن: نەخشان؛ نەخش بەستن؛ ڕەنگ دانەوە؛ وەک وێنەیەکی نەگۆڕ و هەمیشەیی لێهاتن ‹آن رویداد در ذهنش نقش بسته بود: ئەو ڕووداوە لە مێشکیدا نەخشابوو›.

نقش داشتن: دەور هەبوون؛ دەورگێڕان؛ بەشدار بوون؛ دەست هەبوون؛ نەقش هەبوون ‹سفارتخانه‌های خارجی در آوردن و بردن دولت‌ها نقش داشتند: باڵوێزخانە بیانیەکان لە هێنان و لابردنی دەوڵەتەکاندا دەوریان هەبوو›.

نقش زمین شدن: تەختی زەوین بوون؛ پانەوە بوون؛ لە پەڕوو ئێژیایرە؛ بە سەر زەویا درێژەوە بوون ‹یک دفعه افتاد و نقش زمین شد: کوتوپڕ کەوت و تەختی زەوی بوو›.

نقش کردن: کێشان؛ نەخشاندن؛ نتلاندن.

**نقش‌برجسته** / naqšbarceste, -barcaste، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. نەخشی بەرز؛ نەخشی هەڵکەنراو لە سەر ڕووبەرێک، وا کە نەخشەکە زۆپ و تەختەکەی چاڵ بێ.

**نقشبند** / naqšband/: [عربی/ فارسی] صفت. نیگارڤان؛ وێنەکێش؛ شێوەکێش.

**نقشبندی** / naqšbandî ، ـها/: [اعربی/ فارسی]/اسم. شوێنکەوتووی تەریقەتی نەقشبەندییە.

**نقشبندیه** / naqšbandîy(y)e/: [اعربی/ فارسی/ عربی]/اسم. نەخشبەندی؛ نەقشبەندی؛ نەقشبەندییە؛ زنجیرەیەک لە تەریقەکانی سۆفیەتی ناسراو، سەر بە بەهائەدینی نەخشبەند (٧١٨-٧٩١ کۆچی).

**نقش پذیری** / naqšpazîrî/: [اعربی/ فارسی]/اسم. دەورگێڕی؛ لێهاتوویی بۆ وەرگرتن و گێڕانی دەور و نەخش. هەروەها: **نقشپذیر**

**نقشدار** / naqšdār/: [اعربی/ فارسی] صفت. نەخشین؛ نەخشدار؛ بە نەخش ‹پارچەی نقشدار: پارچەی نەخشین›.

**نقشمایه** / naqšmāye ، ـها/: [اعربی/ فارسی]/اسم. تێم؛ بەشێکی بەرچاو و چەندپاتەکراو لە تەختی شوێنەوارێکی هونەریدا.

**نقش ونگار** / naqš-o-negār ، ـها/: [اعربی/ فارسی] /اسم. نەخش‌ونیگار؛ ڕازاوەیی ڕووبەرێک بە ڕەنگ و وێنەی جۆراوجۆر ‹نقش‌ونگار دیوار: نەخش‌ونیگاری دیوار›.

**نقشه** / naqše ، ـها/: [اعربی/ فارسی]/اسم. نەقشە: ١. مەوژ؛ گەڵاڵە؛ بەرنامەیەک لە مێشکدا بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی دیاریکراو ‹برای به دست آوردن سهم شریکش نقشه می‌کشید: بۆ چنگ خستنی بەشی شەریکەکەی نەخشەی دەکێشا› ٢. پلان؛ گەڵاڵەکار: *الف)* بەرجەوەنی ئاسۆیی یا وێستایی بینایەک ‹نقشەی ساختمان: پلانی خانوو› *ب)* ئەوەی دەبێ دروست بکرێ و بەرهەم بێت ‹نقشەی قالی: نەخشەی قالی› *ج)* خەریتە؛ نەخشەی ناوچە، وڵات یان بەژەک یا گۆی زەوین بە سەر کاغەزەوە *د)* وێنەگەلی گەردوونی لە سەر لاپەڕەیەک.

▣ نقشه کشیدن: گەڵاڵە دارشتن؛ نەخشە کێشان: *الف)* بۆ خانوو، ڕێگا، پرد و... *ب)* بۆ بەڕێوە بردنی کارێک و گەیشتن بە ئامانجێ.

نقشه کشیدن برای کسی: نەخشە بۆ کەسێ کێشان: ١. پیلان نانەوە دژی کەسێک ‹نقشەی قتلش را کشیده‌اند: پیلانی کوشتنیان ناوەتەوە› ٢. دابین‌کردنی پێداویستی یان بەرهەڤ‌کردنی پێشەکی بۆ بەڕێوە بردنی کارێک بۆ کەسێ بەبێ ئاگاداری خۆی ‹برایش نقشه کشیده‌اند داماداش کنند: نەخشەیان بۆ کێشاوە بیکەنە زاوا›.

**نقشه‌برداری** / naqšebardārî ، ـها/: [اعربی/ فارسی]/اسم. نەخشەهەڵگری؛ کار و ڕەوتی کۆ کردنەوەی تایبەتمەندیگەلی شوێنێک (وەک: مەوداد، بەرزی و نزمی، چەم، شار، ڕێگە و...) بۆ دابین‌کردنی نەخشە. هەروەها: **نقشه‌بردار**

**نقشه‌خوانی** / naqšexānî ، ـها/: [اعربی/ فارسی] /اسم. نەخشەخوێنی: ١. کار و ڕەوتی تێگەیین لە زانیاریگەلی تۆمارکراو لە سەر نەخشە ٢. کاری خوێندنەوەی ناوی ڕەنگەکان لە ڕووی نەخشەی قالی بۆ تەونکەران (وەک: سێ گوڵخار، دوو شین، یەک کەسک).

**نقشه‌کشی** / naqšekešî/: [اعربی/ فارسی]/اسم. نەقشەکێشی: ١. /ـها/ کار و ڕەوتی پێکهێنانی هەموو پێویستیەک بۆ دابین‌کردنی نەخشە ٢. کار و پیشەی نەقشەکێش.

**نقص** / naqs ، ـها؛ نواقص/: [اعربی]/اسم. ناتەواوی؛ ناتواوی؛ ناتاوی؛ کەم‌وکووڕی؛ کێم‌وکووڕی؛ کەمایەسی؛ کەمایەتی؛ کێمایی؛ کێماسی؛ نین؛ نوون؛ کەڵ‌وکورتی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی ناتەواو بوون ‹کتاب چند صفحه نقص داشت: کتێبەکە چەند لاپەڕە ناتەواوی هەبوو› ٢. دۆخی کەم بوونی شتێک ‹مطلب نقص دارد باید تکمیل شود: وتارەکە کەم‌وکووڕی هەیە دەبێ تەواو بکرێ›.

▣ نقص عضو: کەم‌ئەندامی؛ کەم و کووڕی لە برێ ئەندامانی لەشدا.

نقص فنی: کەم‌وکووڕی لە پێکهاتەی دەزگایەکدا.

**نقصان** / noqsān ، ـها/: [عربی]/اسم. کەموکووڕی؛ کەمایەتی؛ کەمایەسی ‹نقصان آب سدها ناشی از کاهش بارندگی است: کەموکووڕی ئاوی بەربەستەکان بە هۆی کەم بوونەوەی بارانە›.

**نقــض** / naqz/: [عربــی]/اســم. کــار و ڕەوتی هەڵوەشــاندنەوە؛ بــەتاڵ‌کردنــەوە ‹نقض قــانون: هەڵوەشاندنەوەی قانوون›.

**نقطه** / noqte ، ـها؛ نقاط/: [عربی]/اسم. ١. *[هندسه]* خاڵ؛ پنت؛ پنک؛ پن؛ نوختە؛ نوختک؛ نوقتە؛ شوێنی پێک‌گەیشتنی دوو هێڵ ٢. خاڵ؛ پنت؛ پنــک؛ پـــن؛ نوختـــە؛ نوختـــک؛ نوقتـــە: *الف)* نیشــانەیەکی بچــووک دە ئــاخری ڕســتەدا *ب)* پەڵەی زۆر چکۆلە لە سەر و ژێری بــڕێ لــە پیتەکانی ئەلفوبێدا ‹«چ»، سه نقطه دارد «د» نقطه نــدارد: «چ»، ســێ خاڵــی هەیــە «د» خاڵــی نیــە› *ج)* نیشــانەیەکی وا لــە خــەتی ئــەلفوبێتکــەی مورسدا ٣. دەسپێکی قۆناخێک لە نێو ڕەوتێکدا ‹نقطــەی جــوش آب: خاڵــی هاتنــە کوڵــی ئــاو› ٤. شوێن؛ شۆن؛ جێگە؛ جێ: *الــف)* ‹بــە نقطــەی نــامعلومی فرســتاده شــد: ناردرایــە شــوێنێکی نادیــار› *ب)* گوڵ؛ گوڵە؛ بەشێکی دیاریکراو لە ڕووبەرێک ‹در دو نقطەی فرش پارگی وجود داشت: لە دوو گوڵــی فەرشەکەدا دڕاوی هەبوو›.

◘ **نقطەی اتکا**: ١. شوێنی پاڵــدانەوە ٢. *[کنایی]* پشتیوان؛ پشتگر.

**نقطەی اثـر**: خاڵــی کارتێکــەری/ کاریگــەری؛ خاڵــێک لــە شــت کــە تــەوژمی هێــز لــەوێ شوێنەوای هەیە.

**نقطــەی اعتــدال خریفــی**: *[نجــوم]* خاڵــی بەرانبەری پــاییزی؛ خاڵــێکی گرێمانــەیی لــە سەر خولگەی زەوی بــە دەوری هــەتاودا کــە لەوێ، لە نیوجەغزی باکووردا، هــاوین دوایــی دێ و پــاییز دەســت پــێ‌دەکــا و شــەو و ڕۆژ بەرامبەر دێتەوە.

**نقطەی اعتدال بهاری**: *[نجوم]* خاڵی بەرانبەری بەهاری؛ خاڵێک گرێمانەیی لە سەر خولگــەی زەوی بــە دەوری هــەتاودا کــە لــەوێ، لــە نیوجــەغزی بــاکووردا، زســتان دوایــی دێ و بەهار دەست پــێ‌دەکــا و دیســان شــەو و ڕۆژ بەرامبەر دەبێتەوە.

**نقطەی انجماد**: خاڵی بەســتن؛ ڕادەیــەک لــە دەما کە تراوێــک تێیــدا دەرچــێ. هــەروەها: **نقطەی تبخیر؛ نقطەی جوش؛ نقطەی ذوب**

**نقطــەی اوج**: خاڵــی ترۆپــک؛ دهــار؛ دونــد: ١. بەرزترین شــوێنێ کــە تــەنێک پێــی‌دەگــا ٢. بانترین ڕادە لــە پــێش‌چــوونی ڕەوتێکــدا. هەروەها: **نقطەی حضیض**

**نقطەی ثقل**: گرانیگا؛ خاڵی هاوکێشی.

**نقطەی دید**: دیدگا؛ شوێنی ڕوانین.

**نقطەی زرد**: لکەی زرد ☜ **لکّه**

**نقطەی شبنم**: خاڵی شەونم؛ خاڵێک لە گــەرما کە تێیدا هەڵم و بۆقی نێو هەوا، تنۆکە دەکا و دەبێتە شەونم.

**نقطەی ضــعف**: *[مجــازی]* ١. شــوێنێ کــە پتــر بەرئازار دەکەوێ ٢. ناتەواوی یان هەڵەیی کە وێدەچێ بەرهێرش کەوێ.

**نقطەی عطف**: خاڵی بادانــەوە؛ خاڵــی گــۆڕان؛ قۆناخێک بۆ ئاڵوگۆڕکردنی ڕێگــە، لایــەن یــا خێرایی لە ڕەوتێکدا.

**نقطەی کور**: خاڵی کوێر: ١. بەشێکی بچووک لە تۆڕینەی چاوی مۆرغــەداران کــە دەمــاری بینایی لێــوە دێتــە دەرێ و هەســتی بینــایی لەوێدا کوێرە ٢. بەشێ لە مەیدانی ڕوانین یان بەشێ لە مەڵبەند کە بە بۆنەیەکــەوە شــوێنی هەڵناکرێ ‹نقطــەی کــور موبایــل: نوختــەکوێری موبایل›.

**نقطەی مقابل**: پێچەوانە؛ بــە چۆنیــەتی، ڕەوت یان ئاکاری دژبەرانەوە ‹بخشندگی نقطەی مقابل خسیسی است: دلاوایی پێچەوانەی ڕژدیە›.

**نقطەی نظر** ☜ **نقطەنظر**

**نقطه‌بازی** / noqtebāzî/: [عربی/ فارسی]/اسم. نوقته‌بازی؛ نوقته‌نوقته؛ جۆرێ کایه‌ی نێوان دوو یان چه‌ن که‌س که له پێشدا په‌ڕه‌یه‌ک خاڵ‌خاڵ ده‌که‌نه‌وه، ئه‌نجا هه‌رکه‌س له نۆره‌ی خۆیدا هێڵێک ده نێوان دوو خاڵدا ده‌کێشێ، بۆ هه‌ر که‌سێ ئه‌م هێڵانه بوو به چوارگۆشێک، ده‌توانێ دیسانه‌وه هێڵ بکێشێ، ئه‌وی زۆرترین چوارگۆشی پێکهێنابێ سه‌رکه‌وتووه.

**نقطه‌بند** / noqteband، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. خاڵ‌به‌ند؛ نوخته‌ویرگوول؛ نیشانه‌یه‌ک به‌م‌شێوه «؛» که له نێوان دوو ڕسته یان ڕسته و نیوڕسته‌یه‌کدا دێ که مانایان پێکه‌وه به‌سراوه: **نقطه‌ویرگول**

**نقطه‌چین** / noqtečîn، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. نوخته‌چین؛ خه‌ت یان نه‌خشێ به شێوه‌ی خاڵگه‌لی یه‌ک له دوای یه‌ک.

**نقطه‌گذاری** / noqtegozārî، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. خاڵبه‌ندی؛ کاری دانانی نیشانه‌گه‌لی تایبه‌ت (وه‌ک «.» «،» «؛» «:» «؟» «!» «ـ» و ...) له نووسراوه‌یه‌کدا، بۆ ڕوون‌کردنه‌وه‌ی مانا و باش تێگه‌یشتنی خوێنه‌ر.

**نقطه‌نظر** / noqtenazar، ـها؛ ـات/: [عربی]/اسم. ڕوانگه؛ بار و لایه‌نی بیر لێ‌کردنه‌وه، بۆچوون و ده‌ربڕینی بیر و ڕا.

**نقطه‌ویرگول** / noqtevîrgûl/: [عربی/ فرانسوی] ☜ **نقطه‌بند**

**نقل** / naql/: [عربی]/اسم. ١. جێواز؛ جێ‌گۆڕکێ؛ کار و ڕه‌وتی گوێزانه‌وه؛ گۆزانه‌وه؛ گۆزاننه‌وه؛ گواستنه‌وه؛ گوازتنه‌وه؛ گۆزان؛ وارایه‌وه؛ ڤه‌گوهاستن؛ مه‌ره‌قه‌نه‌ی ‹نقل کردن: گواستنه‌وه›. ٢. /ـها/ داستان؛ ڕاز؛ ڕازه؛ چیرۆک؛ حه‌کایه‌ت؛ نه‌قڵ ‹نقل عجیبی است: داستانێکی سه‌یره›.

▣ **نقل قول**: قسه گه‌ڕاندنه‌وه؛ کاری گێڕاندنه‌وه یان نووسینه‌وه‌ی قسه‌ی که‌سێک.

▣ **نقل کردن**: ١. گوازتن؛ ڕاگوێزتن؛ ڕاگوێزاندنه‌وه؛ له شوێنێکه‌وه بۆ شوێنێکی‌تر بردن ٢. گێڕانه‌وه؛ گێڕاندنه‌وه؛ وتنه‌وه؛ واته‌یوه؛ وتن و گه‌ڕاندنه‌وه‌ی قسه یان کاری که‌سێکی‌تر ‹شعری از شامی نقل کرد: شیعرێکی شامی گێڕاوه› ٣. وه‌رگێڕان؛ پاچڤه‌کردن ‹از فارسی به کردی نقل کردن: له فارسیه‌وه بۆ کوردی وه‌رگێڕان› ٤. گێڕاندنه‌وه؛ گه‌ڕاندنه‌وه؛ گێلنایوه؛ حه‌کایه‌ت‌کردن ‹از سفرش به اربیل چیزهای جالبی نقل می‌کرد: له سه‌فه‌ره‌که‌ی بۆ هه‌ولێر شتی سه‌یری ده‌گێڕاوه›.

**نقل مکان کردن**: ماڵ گواستنه‌وه؛ گوێزتنه‌وه؛ گوازتنه‌وه؛ گوێزانه‌وه؛ گۆزانه‌وه؛ گۆزان؛ گۆزاننه‌وه؛ ڤه‌گوهاستن؛ ئاڵ‌وگۆڕ/ ئازوگۆز کردن؛ مه‌ره‌قه‌نه‌ی؛ ئه‌وه‌وارته‌ی؛ وارایوه؛ کرێشه‌یش؛ کرشتش ‹نقل مکان کردیم و رفتیم دو خیابان بالاتر: ماڵمان گواسته‌وه و چووینه دوو شه‌قام ژوورتر›.

**نقل** / noql، ـها/: [عربی]/اسم. شه‌کرۆکه؛ شه‌که‌رات؛ نوقڵ؛ نوغڵ؛ نوقوڵ؛ جۆرێ شیرنی خڕیلانه‌ی سپی له شیله‌ی شه‌کر، تام، بۆن و برێ‌جار خه‌لیله‌ی بادام و پسته.

▣ **نقل محافل**: ١. چه‌ره‌ز و شه‌کر و شیرینی میوانی ٢. /کنایی/ بنێشتی سه‌ر زاران؛ بنێشته‌خۆشه ‹این روزها سخن از سردی هوا نقل محافل شده است: ئه‌م ڕۆژانه قسه‌ی ساردی هه‌وا بوته بنێشتی سه‌ر زاران› ٣. که‌سی زۆر قسه‌خۆشی کۆڕڕازێن.

**نقل‌وانتقال** / naql-o-'enteqāl، ـها/: [عربی]/اسم. ئاڵ‌وگۆڕ؛ ئاڵ‌وگوێز؛ ئازوگۆز؛ یاگه‌وارێ؛ جێ‌گۆڕکێ؛ کرشتش؛ جێبه‌جێیی ‹نقل‌وانتقال معلمان در سه ماهه‌ی تابستان انجام می‌شود: ئاڵ‌وگۆڕی مامۆستایان له سێ‌مانگه‌ی هاویندا به‌ڕێوه ده‌چێ›.

**نقل‌ونبات** / noql-o-nabāt/: [عربی]/اسم. [کنایی] نوقڵ‌ونه‌وات؛ شیرینیگه‌لی جۆراوجۆر ‹خیال کردی آنجا دارند نقل و نبات خیرات می‌کنند؟: پێت وایه

لەوێ نوقل‌ونەوات خێر دەکەن؟›.

**نقلـــی** / naqlî/: [عربـــی] *صـــفت.* گەڕانـــەوەیی: ١. شیاوی گێڕانەوە ٢. تایبەتمەندی زانیاریـەک کە بە گێڕانەوە، قوتابی فێر دەکـرێ و پێویسـت بـە تۆژینـەوە ناکـا (وەک حـەدیس و ڕەوایـەت). بەرانبەر: **عقلی**

**نقلی** / noqlî/: [عربی] *صفت. [گفتاری]* خنجیلانـە؛ خونجیلانـــە؛ بووچکەلاینـــە؛ وردیکلانـــە؛ بووچەلاینە؛ بووچەلانە؛ بووچکەلانە؛ بووچکەلانە؛ نوقڵی ‹خانەی نقلی: خانووی خنجیلانە›.

**نقلیه** / naqlîyye/: [عربی] *صفت.* گواسـتنەوەیی؛ پێڕاگوێز؛ بۆ گواستنەوە ‹وسیلەی نقلیه: کەرەستەی گواستنەوەیی›.

**نـق ـــ نقـو** / neqneqû ، ـهـا/: *صفت. [گفتـاری]* بۆڵەبۆڵـــکەر؛ خـــوتن؛ پرتەکـــەر؛ مشـــقەکەر؛ قۆڕەقۆڕکەر ‹من کارگر نق ـ نقو نمی‌خـواهم: ئـەمن کرێکاری بۆڵەبۆڵکەرم ناوێ›.

**نقوش** / nuqûš, noqûš/: [عربی] جمعِ ☜ **نَقش**

**نـــق‌ونـــوق** / neq(q)-o-nûq/: *اسـم. [تعـریض]* بۆڵەبۆڵ؛ خوتەخوت؛ خوتەوبۆڵە؛ قوتەوبۆڵە؛ گلە و گازندەی لەبەرخۆوە.

**نقیصه** / naqîse ، ـها؛ نقایِص؛ نـواقِص/: [عربـی] *اسـم.* کـەموکـووڕی؛ کـەل‌وکوتـەری؛ کەمایـەتی ‹در صورت بروز نقیصـه کـار عـودت داده مـی‌شـود: ئەگـەر کەموکووڕی بینرا، کارەکە دەنێردرێتەوە›.

**نقـیض** / naqîz/: [عربـی] *صـفت.* ناتـەبا؛ نـاکۆک؛ ناســـاز؛ نـــاجۆر؛ هەڵشـــێوێن؛ هەڵوەشـــێنەر؛ بەتاڵـــکەرەوە؛ تایبەتمەنـــدی ئـــەوەی کـــە پێچەوانەی شتێکی‌ترە و بە بوونی ئەم ئـەوی‌تـر ناتوانێ ببێ (وەک ژیان لە بەرامبەر مەرگەوە).

**نقیضـه** / naqîze/: [عربـی] *اسـم.* ١. قسـە یـان نووسراوەی بێ‌سەروبەر ٢. نووسراوەیەک کـە بـۆ پووچەڵ‌کردنەوەی یەکێکی‌تر دەنووسرێ.

**نک** / nok/: *اسم.* ١. نووک؛ نیچک؛ سەرنووچک؛ نووک؛ نهیک؛ نیک؛ نووکـە؛ تـک؛ نـک؛ کەلـە؛ جقە؛ سەری تیژ و باریکی هەر شـتێ ‹نـک قلم: نووکی قەڵەم› ٢. دندووک؛ دەنـووک؛ دندووکـە؛ نیکـل؛ نووکـل؛ شـەویلاکی بـەرەپێش‌هـاتووی شاخی پەلەوەران.

**نکات** / nokāt, nekāt/: [عربی] جمعِ ☜ **نکته**

**نکاح** / nekāh/: [عربی] *اسم. [ادبی]* نیکـاح؛ نکـا؛ نکاحـــە؛ ژن و مێردایـــەتی؛ ژن و شـــوویی؛ پەیمانێک کە بە پێی ئەوە ژن و پیاوێـک دەبنـە ژن و مێرد و بنەماڵەیەک دروست دەکەن ‹عقد نکاح: نیکاح کردن›.

**نکاستن** / nakāstan/ ☜ **کاستن**

**نکاشتن** / nakāštan/ ☜ **کاشتن**

**نکاف** / nokāf/: [عربی] *اسم.* گوێڕەپە؛ سەرپنوم؛ ملەخڕێ؛ ملەخڕە؛ گەرووخڕە؛ ئۆریون؛ نەخۆشی بناگوێ ئەستوور بوون.

▣ نکـاف گـاو: گەبـە؛ گـابنێزک؛ گـابنێزکی؛ گابنێسک؛ گوێڕەپەی گا.

**نکانک** / nokānok/: *صوت.* نەوکە؛ نووکـەنووک؛ نیکەنیک؛ نیک‌نەک؛ نکەوناڵە.

**نکاویدن** / nakāvîdan/ ☜ **کاویدن**

**نکبت** / nekbat/: [عربی] *اسم.* نەهاتی؛ نەگبـەتی؛ نەهامەتی؛ نامەتی؛ بەڵەگـەور؛ کسـارات؛ کـەت: ١. بەڵەنگازی و هـەژاری ‹نکبت از سرتاپای خانـه می‌بارید: نەهاتی لـە سـەرتاپای ماڵـەکە دەبـاری› ٢. *[گفتـاری]* پەرێشانی و پیسی و پۆخڵی ‹نکبت همه‌جا را فراگرفته بـود: نەگبەتی هـەموو شـوێنێکی داگرتبوو›.

**نکبت‌بار** / nekbatbār/: [عربی/ فارسی] *صفت.* پـڕ لە نەهاتی/ نەگبەتی؛ هاوڕێ لەگەڵ لێقەوماوی، بێ‌دەرەتانی و چەرمەسەری.

**نکبتـــی** / nekbatî/: [عربـــی] *صـــفت. [گفتـــاری]* نەگبەت؛ نامەت؛ چارەڕەش؛ بەدبەخت ‹مردیکـە نکبتی دست از سرم برنمی‌داشت: هەتیوە نەگبەتـە لـێم نەدەبۆوە›.

**نکپیدن** / nakapîdan/ ☜ **کپیدن**

**نکته** / nokte ، ـها؛ نکات/: [عربی]/اسم. ١. خاڵ؛ بابەتی ڕوون و زەق ‹در سخنانش نکتەی مهمی بود: لە قسەکانیدا خاڵیکی گرنگ هەبوو› ٢. پەند؛ کەلەمە؛ ئامۆژگاری؛ مۆچیاری؛ قسەی ڕێنوێنی و بەکەلک ٣. نوکتە؛ نکتە؛ حەنەک؛ خاڵ؛ قسەی خۆش و پێکەنینی.

▣ نکته گرفتن: خاڵ لێگرتن؛ هەڵەگرتن؛ ڕەخنە لێ گرتن.

**نکته‌سنج** / noktesanc ، ـها/: [عربی/ فارسی] صفت. وردبین؛ وردەکار؛ لێهاتوو لە وەرگرتن و وێنا کردنی ناوەڕۆکی ورد و جوانی هەر شتێک و دەربڕینی بە جێگەیاندا. هەروەها: **نکته‌سنجی**

**نکردن** / nakardan/ ☜ **کردن**

**نکره** / nakare/: صفت. ١. ☜ اسم نکره، **اسم** ٢. ـها/[گفتاری] ناپۆڕ؛ نەپۆڕ؛ گڕ؛ زبر؛ ناحەز ‹صدای نکره: دەنگی ناپۆڕ›.

**نکشاندن** / nakešāndan/ ☜ **کشاندن**

**نکشتن** / nakoštan/ ☜ **کُشتن**

**نکشیدن** / nakešîdan/ ☜ **کشیدن**

**نکندن** / nakandan/ ☜ **کندن**

**نکو** / nekû ، ـیان/: صفت. [مخفف] باش؛ چاک؛ نووک؛ عال؛ قەنج.

**نکوباندن** / nakûbandan/ ☜ **کوباندن**

**نکوبیدن** / nakûbîdan/ ☜ **کوبیدن**

**نکوچاندن** / nakûčāndan/: [فارسی/ ترکی/ فارسی] ☜ **کوچاندن**

**نکوچیدن** / nakûčîdan/: [فارسی/ ترکی/ فارسی] ☜ **کوچیدن**

**نکوداشت** / nekûdāšt ، ـها/: اسم. ڕێزگری؛ ڕێوڕەسمێ بو ناساندنی کەسایەتیەک و ڕێز دانان لە کارەکانی لە هەبوونی خۆیدا.

**نکوشیدن** / nakûšîdan/ ☜ **کوشیدن**

**نکوکاری** / nekûkārî/: اسم. ڕندی؛ پیاوچاکی؛ چاکەکاری؛ پیاوەتی؛ پیاگەری. هەروەها: **نکوکار**

**نکول** / nekûl/: [عربی]/اسم. نکوول؛ نکوولی؛ حاشا؛ کاری خۆ پاراستن لە دانی پارەی بەرات یان حەواڵە.

▣ نکول شدن برات: نکوول بوونی بەرات؛ نەدرانی پووڵی بەرات. هەروەها: **نکول کردن برات**

**نکولی** / nekûlî/: [عربی] صفت. نکوول کراو ‹براتهای نکولی: بەراتە نکوول کراوەکان›.

**نک‌ونال** / nek(k)-o-nāl ، ـها/: اسم. [گفتاری] نکەونالە؛ نووکەنووک؛ ورکەورک؛ نکەنک؛ نیکەنیک؛ نوکەنوک ‹دیروز دخترم آمده بود، از دست شوهرش نک‌ونال می‌کرد: دوێنێ کچەکەم هاتبوو، لە دەست مێردەکەی نکەونالەی بوو›.

**نکوهش** / nekûheš ، ـها/: اسم. [ادبی] ١. لۆمە؛ سەرکۆنە؛ سەرکۆ؛ ولە؛ پلار؛ سۆرین ٢. خراپەبێژی.

**نکوهیدن** / nekûhîdan/: مصدر. متعدی. [ادبی] // **نکوهیدی**: چفاندت؛ **می‌نکوهی**: دەچفێنی؛ **نکوهش کن**: بچفێنە// چفاندن؛ سەرکۆنەکردن؛ چەرقین؛ لۆمە کردن؛ ولەکەردەی؛ سەرزەنشت کردن؛ بە سەرا چوون/ هاتنەوە. هەروەها: **نکوهیدنی**

■ صفت فاعلی: **نکوهنده** (چفێنەر)/ صفت مفعولی: **نکوهیده** (چفێنراو)

**نکوهیده** / nekûhîde/: صفت. [ادبی] ناپەسەن؛ ناشایست؛ ناشایس؛ نەشیاو؛ ناشاسە؛ شیاوی لۆمە ‹رفتار نکوهیده: ئاکاری ناپەسەن›.

**نکهت** / nekhat/: [عربی]/اسم. [ادبی] ١. بۆی هەناسە ٢. بەرامە؛ بەرام؛ لابانتە؛ بۆنی خۆش؛ بۆن و بەرامە.

**نگاتیف** / negātîf/: [فرانسوی] ☜ **نگاتیو**

**نگاتیو** / negātîv/: [فرانسوی]/اسم. فیلم؛ نگاتیف؛ وێنەی سەر فیلم و کاغەز کە ڕوونی و ڕەشاییەکانی پێچەوانەیە.

**نگار** / negār/: اسم. نیگار؛ نگار: ١. [ادبی] نەققاشی؛ شێوە؛ شکڵی بە دەست کێشراو

۲. /ادبی/ دلـدار؛ دڵـبەر؛ یـار؛ دۆستی کـچ ۳. خەتی ئاو؛ هێڵی بەستێن؛ شوێنەواری ئاو لە سەر قەراخی چۆم.

**ـ نگار** [۲]: *پیوٚژه.* ـ نگار: ۱. ـ نووس؛ ـ نڤیس؛ ـ وان ‹تاریخ‌نگار؛ روزنامه‌نگار: مێژوونووس؛ ڕۆژنامەوان› ۲. ـ کێش ‹چهره‌نگار: وێنەکێش›.

**نگارخانه** / negārxāne ، ـها/: /*اسم.* نیگارخانە: ۱. کارگـەی وێنەکێشی ۲. شـوێنی ڕانانی نەققاشی و شێوە.

**نگارستان** / negārestān ، ـها/: /*اسم.* [*قدیمی*] نیگارخانە.

**نگارش** / negāreš/: /*اسم.* ۱. کاری نووسین؛ نڤیسین ۲. نووسەری؛ نڤیسیاری.

**نگارشات** / negārešāt/: (!) [فارسی/ عربی] /*اسم.* نووسراوەگەل؛ نوسراوەکان؛ کۆمەڵێ لە نووسراوە ‹«تاریخ اردلان» یکی دیگر از نگارشات مستوره است: «مێژووی ئەردەلان» یەکێکی‌تر لە نووسراوەکەلی مەستوورەیە›.

**نگارگر** / negārgar ، ـها؛ ـان/: /*اسم.* ۱. مینیاتوریست؛ وێنەکێشی مینیاتور ۲. نەقاش؛ وێنەکێش؛ نیگارڤان؛ شێوەکێش.

**نگارنده** / negārande ، ـها؛ ـگان/: /*اسم.* نووسەر؛ نڤیسەر ‹نگارنده‌ی مقاله: نووسەری وتار›.

**نگاری** [۱] / negārî/: /*اسم.* ۱. گیپاڵ؛ بەشی دووهەمی گەدەی کاوێژکەران کە خۆراکی تێدا تا ڕادەیەک هەرس دەبێ و دیسانەوە بۆ کاوێژ دێتەوە ناو دەم ۲. /ـها/ نیگاری؛ کەرستەیەک بۆ شیرە کێشان بە لوولەیەکی درێژ و سەرێکی گۆپیتک وەک سەری ئاوپاشەوە.

**ـ نگاری** [۲]: *پیوٚژه.* ۱. ـ وانی؛ ـ نووسی؛ ـ نڤیسی ‹روزنامه‌نگاری: ڕۆژنامەوانی› ۲. ـ کێشی ‹چهره‌نگاری: ڕوومەت‌کێشی›.

**نگاشتن** / negāštan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **نگاشتی:** نووسیت؛ **می نگاری:** دەنووسی؛ **بنگار:** بنووسە // ۱. نووسین؛ نڤیسین؛ نڤیساندن؛ نووساندن؛ نویستەی؛ نویسەی ‹نگاشتن کتاب: نووسینی کتێب› ۲. کێشان؛ ڕەسم‌کردن؛ نتلاندن؛ نەخشاندن؛ شێوەکێشان؛ وێنەکێشان ‹تصویر زیبایی را بر دیوار نگاشته بود: وێنەیەکی جوانی لە سەر دیوار کێشابوو› ۳. ڕازاندنەوە؛ تەوزاندن؛ نەژرنایش؛ ئەوەڕازنەی ٤. ڕەوێشتن؛ هەڵکەندن؛ کەنایش؛ کەناین. هەروەها: **نگاشتنی**

■ صفت فاعلی: **نگارنده** (نووسەر)/ صفت مفعولی: **نگاشته** (نووسراو)/ مصدر منفی: **نَنگاشتن** (نەنووسین)

**نگاه** / negāh ، ـها/: /*اسم.* تەماشا؛ تماشا؛ تەماشە؛ تواشا؛ تەواشا؛ نیگا؛ نوار؛ نۆڕ؛ نۆڕە؛ نێڕ؛ ڕوان؛ نیا؛ ئیسفا؛ مەیز؛ مێزە؛ فە؛ فت؛ سوێ؛ مەتە؛ نێ: ۱. هێف؛ هێڤ؛ هێو؛ فێر؛ کاری ڕوانین ‹نگاه خشمگین: تەماشای گرژ› ۲. چاو؛ چەم؛ چەو؛ چاڤ؛ دیە؛ دیدە ‹نگاهش را به من دوخته بود: چاوی بڕیبووە من› ۳. بزوانێکی خێرای چاو ‹تنها یک نگاه او را دیدم: تەنیا بوارێک دیتم› * **نگه** [*مخفف*]

⊡ نگاه خریداری: بە چاوی کڕیار؛ بە چاو موشتەری؛ چاوی کڕیارانە/ موشتەریانە ‹نگاه خریداری به کفش‌ها انداخت: بە چاوی کڕیار لە کەوشەکانی ڕوانی›.

نگاه هیز: تەماشای حیزانە؛ ڕوانینێک پڕ لە حەز و تۆلازی ‹از نگاه هیزش مورمورم شد: لەو تەماشای حیزانەی مووچرکم پێداهات›.

⊡ نگاه انداختن: چاو خشاندن؛ چاو لێ‌کردن؛ چاو لێ‌خستن؛ چەم وسەی؛ چاو گەڕاندن؛ چەم گێڵنەی؛ لێ‌نوارین؛ لێ‌ڕوانین؛ لێ‌نۆڕین؛ لێ‌نەڕین؛ لێ‌نهێڕین؛ لێ‌نێڕین ‹نگاهی به این روزنامه بینداز!: چاوێک بخشێنە بەم ڕۆژنامەدا!›.

نگاه چپ کردن: لار تماشا/ تواشا کردن؛ لار بۆ ڕوانین؛ خراپ تەمەشا کردن؛ لار دیەی ‹اگر کسی به تو نگاه چپ بکند، شکمش را سفره می‌کنم: ئەگەر کەسێ لار تماشات کا، سکی ئەدڕم›.

نگاه داشتن ☜ **نگهداشتن**

نگاه کردن: ڕوانین؛ نوارِین؛ نهێڕین؛ نێڕین؛ نۆڕین؛ نووڕین؛ نێڕان؛ نیان؛ نیا دایەنە؛ چاو لێ کردن؛ فتران؛ فتراندن؛ فێرکردن؛ فێرکرن؛ نیا کردن؛ سەحکرن؛ مێزەکردن؛ فتکرن؛ تواشا/ تماشا/ تەماشا کردن؛ تەماشەکەردەی: ۱. چاوی خۆ برینە شوێنێک ‹توی چشم من نگاه کن!: بڕوانە ناو چاوی من!› ۲. لێڕوانین؛ سەرنج دان ‹دکتر زخمش را نگاه کرد: دکتۆر چاوی لە برینەکەی کرد› ۳. ورد بوونەوە؛ هەڵسەنگاندن ‹نگاه کردم دیدم بد هم نمی‌گوید: هەڵسەنگاندم دیتم خراپیش نایژێ›.

نگاه کسی به کسی/ چیزی افتادن: چاوی کەسێک بە کەسێ/ شتێک کەوتن ‹نگاهش افتاد به سقف: چاوی کەوتە بنمیچەکەوە›.

نگاه نکردن: *[مجازی]* ئاوڕ لێ‌نەدانەوە؛ نەڕوانین؛ بە هێند نەگرتن؛ تەواشا نەکردن؛ نەدیەی؛ بایەخ پێ نەدان؛ بە چ نەزانین ‹دیگر به دوری و سختی راهش نگاه نکردم و راه افتادم: ئیدی ئاوڕم لە دووری و دژواری ڕێگاکە نەدایەوە و کەوتمە ڕێ›.

نگاه ـ نگاه کردن: مۆڕ بردنەوە؛ تێڕ کردنەوە؛ تێڕکەردەیوە؛ بە تووڕەیی و واق‌وڕمایەوە لێ مات بوون.

نگاهبان / negāhbān/ ☜ **نگهبان**

نگاهبانی / negāhbānî/ ☜ **نگهبانی**

ـ نگاهدار / negāhdār/ ☜ **ـ نگهدار**

نگاهداری / negāhdārî/ ☜ **نگهداری**

نگاییدن / nagāyîdan/ ☜ **گاییدن**

نگداختن / nagodāxtan/ ☜ **گداختن**

نگذاشتن / nagozāštan/ ☜ **گذاشتن**

نگذراندن / nagozarāndan/ ☜ **گذراندن**

نگذشتن / nagozaštan/ ☜ **گذشتن**

ـ نگر / negar/: *پیواژە.* ـ نوار؛ ـ نۆڕ؛ ـ ڕوان؛ ـ نهۆڕ؛ ـ بین؛ ـ وین ‹آینده‌نگر: دوورنوار›.

نگران / negarān/: *صفت.* پەشێو؛ دڵەودوا؛ دڵبەدوا؛ نیگەران؛ نیەران؛ دڵخورت؛ دڵپەرێشان؛ دەهەدل: ۱. پەشۆکاو؛ ترس داگرتوو ‹دنیا نگران جنگ هسته‌ای بود: دنیا پەشێوی شەڕی ئەتومی بوو› ۲. پەرێشان؛ ناڕەحەت ‹نگران نباش! فردا می‌آیم: پەرێشان مەبە! سبەی دێم›.

نگرانی / negarānî ، ـها/: *اسم.* پەشێوی؛ نیگەرانی؛ دڵخورتی؛ دڵپەرێشانی؛ پەژارە؛ تاتیل: ۱. دڵگرانیەکی زۆر بە هۆی ترس یان بار و دۆخێکی نالەبارەوە ‹نگرانی از جنگ: نیگەرانی لە شەڕ› ۲. حەز و وازی زۆر وێڕای ترس و دڵخورتی ‹نگرانی به خاطر بچه‌ها: دڵخورپێ بۆ منداڵان› ۳. *[روان‌شناسی]* هەست بە ترس و دڵەڕاوکێی زۆر وێڕای ئارەق دەردان، دڵەتەپە و ئاڵۆزی، بە هۆی دوودڵ بوون لە ڕاست و درۆیی و چۆنیەتی ڕوودانی هەڕەشە و مەترسی و بە خۆدا نەپەرمان لە ڕووبەڕوو بوونەوەیان.

نگرداندن / nagardāndan/ ☜ **گرداندن**

نگردیدن / nagardîdan/ ☜ **گردیدن**

نگرش / negareš ، ـها/: *اسم.* ڕوانگە؛ بەراوردی هزر و بیر لە شتێک و شێوەی هەڵسەنگاندنی ئەو شتە؛ تێڕوانین؛ بۆچوون.

نگرفتن / nagereftan/ ☜ **گرفتن**

نگرویدن / nageravîdan/ ☜ **گرویدن**

نگره / negare/ ☜ **نظریه**

ـ نگری / negarî/: *پیواژە.* ـ نواری؛ ـ نۆڕی؛ ـ ڕوانی؛ ـ بینی؛ ـ وینی ‹آینده‌نگری: دوورنواری›.

نگریاندن / nageryāndan/ ☜ **گریاندن**

نگریختن / nagorîxtan/ ☜ **گریختن**

نگریستن / nagerîstan/ ☜ **گریستن**

نگریستن / negarîstan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **نگریستی:** ڕوانیت؛ **می نگری:** دەڕوانی؛ **بنگر:** بڕوانە// ڕوانین؛ نوارین؛ نۆڕین؛ نێڕین؛ نهێڕین؛ نهیڕین؛ نهێرتن؛ نێرتن؛ نێڕان؛ نیان؛ نەیرین؛ مەیزین؛

مەیزاندن؛ مێزەکردن؛ باناندن؛ فتران؛ فترانـدن؛ نورسـتن؛ نۆڕسـن؛ هـەونیایش؛ هـۆوەنیش؛ وەینیـایش؛ هێڕانـدن؛ دیـای؛ دیـەی؛ نادەینـە: ۱. چاو لێکـردن؛ چـاو خسـتن؛ چـەم وسـەی؛ تێڕوانین؛ لێڕوانین؛ بۆ دیتنی شتێک چاوی خـۆ تیـژ کردنـەوە ‹بـە آسمان نگریستن: بـۆ ئاسمـان ڕوانین› ۲. ورد بوونەوە؛ سەرنج دەی؛ هێل‌کردن ‹به آیندەی کار نگریستن: بۆ داهاتووی کـار ڕوانـین›.

هەروەها: **نگریستنی**

■ صـفت فـاعلی: **نگرنـده** (ــ)/ صـفت مفعـولی: **نگریسته** (ـ)/ مصدر منفی: **نَنگریستن** (نەڕوانین)

**نگزاردن** / nagozārdan/ ☜ **گزاردن**

**نگزیدن** / nagazîdan/ ☜ **گزیدن**

**نگزیدن** / nagozîdan/ ☜ **گزیدن**

**نگستراندن** / nagostarāndan/ ☜ **گستراندن**

**نگستردن** / nagostardan/ ☜ **گستردن**

**نگسستن** / nagosastan/ ☜ **گسستن**

**نگشتن** / nagaštan/ ☜ **گشتن**

**نگشودن** / nagošûdan/ ☜ **گشودن**

**نگفتن** / nagoftan/ ☜ **گفتن**

**نگماشتن** / nagomāštan/ ☜ **گماشتن**

**نگنجیدن** / nagoncîdan/ ☜ **گنجیدن**

**نگنداندن** / nagandāndan/ ☜ **گنداندن**

**نگندیدن** / nagandîdan/ ☜ **گندیدن**

**نگو** / nagû/: حرف.[گفتاری] تومەز؛ تمەز؛ تۆمەز؛ تومـەس؛ توومـەز؛ تمەزمەکـە؛ تومـەس‌مەکـە؛ مەیژە؛ مەکە؛ تۆ مەڵێ ‹نگو جیبم سوراخ بوده و کلید از افتـاده: تومـەز گیرفـانم کـون بـووە و کلیلەکـە داکەوتووە›.

**نگوزیدن** / nagûzîdan/ ☜ **گوزیدن**

**نگون** / negûn/: صفت.[ادبی] ئاوەژوو؛ بەراوەژوو؛ بـەرەواژ؛ بـەرواژی؛ سـەرەوژێر؛ هەڵـگەڕاو؛ هەڵـەوگەڕیاگ؛ سـەرەوخوار؛ داڵـۆچیاگ؛ داڵـۆچکە؛ نخـوون؛ نـووخن؛ نوخـوون؛ نـوون؛ سەرنخوون؛ قلپ؛ نگـم؛ نگـوم؛ نوگـوم؛ نگـووم؛ نقۆت؛ وەڵودیم؛ ڤاژی؛ وەرگەڕاو.

**نگونبخت** / negûnbaxt/: صفت.[ادبی] چارەڕەش؛ بـەختهەڵـگەڕاو؛ بـەخت‌کـۆر؛ بـەختڕەش؛ سیابەخت؛ لێقەوماو.

**نگونسار** / negûnsār ، ـها/: اسم. گوڵـەئاگرۆ؛ گوڵەعەرعەری؛ گوڵـەچنگووڵە؛ پەنجەمریـەمێ؛ گوڵەئاگرین؛ ئاڵفەگیایەکی ڕازێنەیی پایا بە لقی ژێر زەوینی، گوڵی سەراوەژووی سپی، پەمـەیی یان بنەوشەوە: **بُخور مریم؛ سیکلامِن؛ سیکلمه**

**نگونسار** ً: صفت. نگمەسـار؛ نوقمەسـار؛ سـەرابن؛ سـەرنخوون؛ نوخمەسـار؛ سـەرنخوون؛ سەرنوخین؛ سەرەونوون؛ سەرەوعن؛ سەروخوار؛ سەربەرەخوار.

**نگه** / negah/ ☜ **نگاه**

**نگهبان** / negahbān ، ـها؛ ـان/: اسم. پاسـەوان؛ پاسـبان؛ پاسـەبان؛ پـازگر؛ زیرەڤـان؛ زێرەڤـان؛ نگابـان؛ نیـاوان؛ جەزایـەرچی؛ ئێشـکچی؛ ئێشک‌گـر؛ ئاگـادار؛ چـاودێر؛ چـاوێر؛ چـاوەدێر؛ دبدۆب؛ دبدب؛ نۆبەچی؛ نۆبەدار؛ نۆگـەچی؛ ئـەو کەسە چاوەدێری شوێنێکە: **نگاهبان**

**نگهبانی** / negahbānî/: اسـم. پاسـەوانی؛ پاسەبانی؛ قـۆڵ؛ ئێشـک؛ نگابـانی؛ چـاوەدێری: ۱. کـار یـان پیشـەی پاسـەوان ۲. کـاری پاسەوانی‌کردن * **نگاهبانی**

ـ **نگهدار** / negahdār/: پیوا‌ژه.[گفتاری] ـ پـارێز؛ ـگر؛ ـ نگـادار؛ ـ ڕاگـر ‹جانگهدار: شـوێن‌پـارێز›: ـ **نگاهدار**

**نگهداری** / negahdārî/: اسم. ۱. کـار و ڕەوتی ڕاگرتن؛ هەڵگرتن ‹نگهداری پول در خانه کار درستی نیست: ڕاگرتـنی پارە لە ماڵدا کارێکی دروست نیـە› ۲. کەتوانی؛ پەرسـتاری؛ ئاگـاداری؛ هاگـاداری؛ پارێزەری؛ پارێزگـاری؛ چـاوەدێری؛ سـەغبیری؛ سەرپەرشتی؛ سەرپەرستی؛ خوێـداری؛ ئیمـات؛ ئێـوەت ‹نگهداری بچـەهـا: چـاوەدێری منـدالان› ۳. ئاگاداری؛ هاگاداری؛ سـەغبیری؛ پاراسـتن و

كەڵــــتەكردنی شـــتێک (وەک مـــاڵ، ماشـــین، یەخەچاڵ و...) بۆ لە كەڵـك نەكـەوتن ‹هزینـەی نگهداری بـه عهـدەی صاحب‌خانـه است: خـەرجی ئاگاداری لە ئەستۆی خاوەن‌ماڵدایە› ✽ **نگاهداری**

**نگهداشـــتن** / negahdāštan/: *مصـدر. متعـدی.* // **نگهداشـــتی:** ڕاتگـرت؛ **نگـەمـی‌داری:** ڕادەگـری؛ **نگهـــــدار:** ڕاگـــرە // ڕاگـــرتن: ١. هەڵـــگرتن؛ هێشـــتنەوە؛ ئاسـتەیوە؛ ئەوەئاسـەی؛ هێلشـــتن؛ دانـــان؛ هەڵشـــتن؛ هشـــتن؛ هێشـــتن؛ هـــێلان؛ هێلانەوە ‹برای بعد نگهداشتن: ڕاگـرتن بۆ دوایـی› ٢. بەرگرتن؛ وەرگێرتەی؛ وێستاندن؛ وەستاندن؛ ڕاوەســـتاندن؛ مـــدرنای؛ گلدانـــەوە؛ هەڵشـــتن؛ هشـــتن ‹ماشـین را نگهـدار!: ماشـینەكە ڕاگـرە!› ٣. هێشتنەوە؛ ئاستەیوە؛ ئەوەئاسەی؛ هەڵشـــتن؛ هشـــتن؛ هێشـــتن؛ هـــێلان؛ هێلانـــەوە ‹سر پـا نگهداشتن؛ ساکت نگهداشتن: بە سـەر پێـوە ڕاگرتن؛ بێ‌دەنـگ ڕاگرتن› ٤. پاراســـتن؛ بـەڕێوە بـردن؛ سەرپەرشـتی‌كـردن؛ ئاگـاداری‌كـردن؛ هشـــتن؛ هاگاداری‌كەردەی؛ وەی‌كەردەی؛ نگاداری‌كردن؛ نگا هێشتن؛ ئاگا لێ‌بوون ‹مملکت نگهداشتن: وڵات پاراستن› ٥. ئاگاداری‌كردن؛ پاراستن؛ پارێزنەی؛ پارازتن؛ كەتوانی‌كردن؛ پایین؛ پێـوان ‹از آفت و بلا نگهداشتن: لە ئازار و بەلا پاراستن› ٦. چاودێری كـردن؛ كـەتوانی كـردن؛ پێڕاگەیشـتن ‹بـاغ را نگهداشتن: لە باخ چاودێری كـردن› ٧. پاراسـتن؛ پارازتن ‹حرمت کسی را نگهداشتن: ڕێـزی كەسـێک ڕاگرتن› ٨. پاراستن؛ هەڵـگرتن؛ شـاردنەوە ‹راز کسـی را نگهداشـتن: ڕازی كەسـێک ڕاگـرتن› ✽ **نگاەداشتن**. هەروەها: **نگهداشتنی**

■ صفت فاعلی: **نگهدارنده** (ڕاگـر)/ صفت مفعولی: **نگهداشته** (ڕاگـیراو) / مصـدر منفـی: **نگـەنداشـتن** (ڕانەگرتن)

**نگیراندن** / nagîrāndan/ ☜ **گیراندن**

**نگین** / negîn ، ـهـا/: *اسم.* نگـین؛ نقـیم؛ نقـێم؛ قـــاش؛ خـــاش؛ قـــاژ؛ نەقیمـــە؛ مۆرخانـــە؛ قاشەئەنگوســـتیلە؛ بـــەردی ڕازاوەی ســـەر ئەنگوستیلە (یان خشڵی‌تر وەک گوارە و ملوانكە).

**نلافیدن** / nalāfîdan/ ☜ **لافیدن**

**نلرزاندن** / nalarzāndan/ ☜ **لرزاندن**

**نلرزیدن** / nalarzîdan/ ☜ **لرزیدن**

**نلغزاندن** / nalaqzāndan/ ☜ **لغزاندن**

**نلغزیدن** / nalāqzîdan/ ☜ **لغزیدن**

**نلقیدن** / nalaqqîdan/: [فارسی/ کـردی/ فارسـی] ☜ **لقیدن**

**نلمباندن** / nalombāndan/ ☜ **لمباندن**

**نلمیدن** / nalamîdan/ ☜ **لمیدن**

**نلندیدن** / nalondîdan/ ☜ **لندیدن**

**نلنگیدن** / nalangîdan/ ☜ **لنگیدن**

**نلولیدن** / nalûlîdan/ ☜ **لولیدن**

**نلهیدن** / nalehîdan/ ☜ **لهیدن**

**نلیسیدن** / nalîsîdan/ ☜ **لیسیدن**

**نم** / nam/: *اسم.* نم؛ نەم؛ شە؛ شێ؛ شـی؛ شـۆ؛ وت؛ هوت؛ هـووت؛ هلـمدو؛ مـچ؛ چـام؛ مچـڵەو؛ تربووس؛ دەلانە؛ ڕەوا؛ نێ؛ لـەزم؛ هێمـی؛ هێـو؛ هێوی؛ هێوایی؛ هێویتی؛ هێمـێتی؛ تەڕاییـەكی كەم.

⊡ **نم پس ندادن:** *[مجازی]* تووک لـێ‌نەبوونـەوە؛ موو لێ‌نەكنیانەوە؛ ئاو لە دەست نەتكان؛ چـی لێ هەڵنەوەرین ، نەخوازە لە بـەر ڕژدی ‹هر چه اصرار کردم نم پس نداد: هـەرچێ پـێم داگـرت تووکی لێ نەبووەوە›.

**نم دادن:** نم دان؛ شۆكێشان؛ نم‌كێشـان؛ شـە هەڵێنان؛ نم دەی/ دای؛ شـۆرە ئاسـەی؛ شـۆ ئاســـتەیرە؛ تـــەڕایی دان ‹دیـوار نـم داده بـود: دیوارەكە نمی دابوو›.

**نم داشتن:** نم/ تەڕایی هەبوون؛ نم بیـەی؛ نم/ نمدار/ شەدار بوون ‹هنوز خشک نشده، کمی نم دارد: هێشتا ویشک نەبۆتەوە، كەمێ نمی هەیە›.

**نم زدن:** نم‌دان؛ نەماندن؛ نم لێدان؛ تەڕكردن؛ نماندن ‹نم زدم، گذاشتم زیر تشک صاف بشود:

نمبرداً، نامه زێر دۆشەکەکە ساف ببێ›.
نم کردن: *[مجازی]* ئاو کردنە پا؛ بە زمانلووسی و زمانبازی، خەڵک فریو دان و کردنە یاری خۆ.
نم کشیدن: نم/ شۆ/ شە کێشان؛ نمکێشتەی؛ شە هەڵێنان؛ هووت ئانتش ‹کتابها توی زیرزمین نم کشیده بود: کتێبەکان لە ژێر زەویدا شەیان کێشابوو›.

**نما** [1] / nemā, namā ، ـها/:*اسم*. ڕووکار؛ دەمکار؛ نما؛ دیمەن؛ بەرجەوەنی لای دەرەوەی خانووبەرە، بەتایبەت ئەو لایەی دەڕوانێتە سەر کۆڵان و دەرگای لە سەرە.

**نماـ** [2]: *پێشواژە*. ١. نماـ؛ سەر بە ڕووکاری شتێک ‹نماشویی: نماشۆری› ٢. نوێنـ؛ نیشانـ؛ نواندنی شتێک ‹نماگر: نوێنەر›.

**ـ نما** [3]: *پیواژە*. ـ نوێن؛ ـ نوان؛ ـ نما: ١. شاندەر؛ نیشاندەر ‹قبلەنما: قیبلەنوێن› ٢. ـئاسا؛ وەک؛ وەکی ‹دشمن دوستنما: دژمنی دۆستنما›.

**ـ نمائی** / nemā'î, namā'î/ ☜ **ـ نمایی**

**نمابر** / nemābar/ ☜ **دورنگار**

**نماد** / nemād, namād, nomād ، ـها/:*اسم*. نیشانە؛ نوێنە؛ نمانا؛ دیاردە؛ دروشم ‹صلیب نماد مسیحیت است: خاچ نیشانەی مەسیحیەتە›.

**نمادگرا** / nemādgerā, namād-, nomād- ، ـها؛ ـیان/:*اسم*. نماناواز؛ نیشانەخواز؛ نموودەخواز؛ نماناگر؛ سەمبولیست: ١. لاگری شێوازی سەمبولیک دە هونەردا ٢. سەر بە نماناوازی.

**نمادگرایی** / nemādgerāyî, namād-, nomād-/: *اسم*. نماناوازی؛ نیشانەخوازی؛ نماناگری؛ نموودەخوازی: ١. هونەری لە کار هێنانی نمانا و نیشانە، بەتایبەت کەڵکگرتن لە شتی دیار و ئاسایی بۆ دەربڕینی مانایەکی نادیار و چەتوون ٢. شێوازێکی هونەری بۆ دەربڕینی ڕاستی و بار و دۆخی ئارمانجی و نادیار ٣. کاری کەڵک وەرگرتن لە نیشانەگەلی باو بۆ شاندانی بوونەوەرانی ئاسمانی.

**نمادی** / nemādî, namādî, nomādî/ ☜ **نمادین**

**نمادین** / nemādîn, namādîn, nomādîn/: *صفت. [ادبی]* نمانایی؛ نیشانەیی؛ سەمبولیک: ١. بە تایبەتمەندی کەڵک گرتن لە نمانا و نیشانەوە ٢. لە خۆگری نمانا و نیشانە ٣. بە چۆنیەتی و تایبەتمەندی نیشانەییەوە ‹اندیشەی نمادین: بیری نمانایی› * **نمادی**

**نماز** / namāz ، ـها/:*اسم*. نوێژ؛ نڤێژ؛ نمێژ؛ نەماژ؛ نۆژ؛ نێژ؛ مێژ؛ نەماج؛ نما؛ نمێ: ١. ئاییینی تایبەتی موسوڵمانان بۆ سکاڵا لەگەڵ خوادا بە خوێندنی حەمد و سوورە و چەند دۆعای‌تر هاوڕی لەگەڵ ڕاوەستان و چوونە ڕکوع و سوجدەدا ٢. ڕاز و نیاز لەگەڵ خودا.

▣ نماز آیات: نوێژی ئایات؛ نوێژێکی تایبەت لە کاتی ڕووداوە نائاسایییەکانی سروشت (وەک بوومەلەرزە و مانگ و خۆرگیران).

نماز استسقا: نوێژە بارانە؛ نڤێژا بارانێ؛ نوێژی دوو ڕکاتی لە کاتی وشکەسالی و بێبارانیدا، بۆ هاتنی باران.

نماز تراویح: تەراوێح؛ نوێژی تایبەت بە شەوانی مانگی ڕەمەزان.

نماز جماعت: نوێژی جەماعەت؛ نوێژی بە کۆمەڵ لە پشتەسەری پێشنوێژەوە.

نماز جمعه: نوێژی جومعە؛ نوێژی هەینی؛ نوێژی جەماعەتی ڕۆژی هەینی کە خەڵک لە شوێنێکی شار یان گونددا دەیخوێنن.

نماز خفتن ☜ **نماز عشا**

نماز شکسته: قەسر؛ نوێژی ڕێبواران کە چوار ڕکات بە دوو ڕکات دەخوێنن.

نماز عشا: نوێژی شێوان؛ نوێژی خەوتنان؛ نوێژ عیشا؛ نوێژی ئاخری شەو کە چوار ڕکاتە: **نماز خفتن**. هەروەها: **نماز صبح**؛ **نماز ظهر**؛ **نماز عصر**؛ **نماز مغرب**

نماز میت: نـوێژی مـردوو؛ نـوێژێ کـه پـێش ناشتنی مردووی موسوڵمان دەخوێنرێ.

▣ نماز خواندن: نوێژ خوێندن؛ نۆژ خۆندن؛ نوێژ کردن؛ نما وەنەی/ وانتەی: **نماز گزاردن** *[ادبی]*

نماز گزاردن ☜ **نماز خواندن**

**نمازخانه** / namāzxāne ، ـها/: *اسم.* نوێژخانە؛ نوێژگە؛ دیوی تەرخان‌کراو بۆ نوێژ خوێندن.

**نمازخوان** / namāzxān ، ـها/: *اسم.* نوێژخـوێن؛ نوێژکـەر؛ نماکـەر؛ ئـەوی بـە نـوێژ خوێنـدن ڕاهاتووە.

**نمازگزار** / namāzgozār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* نوێژکەر؛ نوێژخوێن؛ نڤێژکەر؛ مێژکەر؛ نماکەر.

**نماسازی** / nemāsāzî/: *اسم.* نماکـاری؛ کـار و ڕەوتی دروست‌کـردن و ڕازاندنـەوەی ڕووکـاری خانووبەرە ‹این سنگ در نماسازی کـاربرد دارد: ئـەم بەردە بۆ نماکاری بەکەڵک دێ›.

**نماسیدن** / namāsîdan/ ☜ **ماسیدن**

**نماگر** / nemāgar ، ـها/: *اسم.* شاشـە؛ پـەڕەی شاندان.

**نمالیدن** / namālîdan/ ☜ **مالیدن**

**نمام** / nammām/: [عربـی] *صـفت.* تێچـێن؛ بەزاجکـەر؛ شـەیتانی‌کـەر؛ دووزمـان؛ دووزبـان؛ بەکرۆک؛ چوولوو؛ دۆقلمەر؛ نێوان‌تێکدەر.

**نماندن** / namāndan/ ☜ **ماندن**

**نماهنگ** / namāhang ، ـها/: *اسم.* کلیپ؛ پاژێکی مووسیقایی کە دەگەڵ وێنەدا بلاو دەکرێتەوە.

**نمایان** / nemāyān, namāyān/: *صفت.* ۱. دیـار؛ ئاشکرا؛ خویا؛ منامنا؛ منێ؛ ڕیـچ؛ پەیـدا ‹مـاه در گوشەی افق نمایان بود: مانگ لە گۆشەی ئاسۆوە دیار بوو› ۲. گرینگ؛ زەق؛ بەرچاو ‹کار نمایان: کـاری گرینگ›.

**نمایاندن** / nemāyāndan, namāyāndan/: *مصدر. متعدی.* // **نمایاندی**: ڕاتنوانـد؛ **مـی نمایـانی**: ڕادەنـوێنی؛ **بنمایـان**: ڕابنوێنـە// ڕانوانـدن؛ ڕانـان؛ ناوتش؛ ناوایش؛ ئرمانەی؛ ئەرمانای؛ مۆژنـایش؛ نوڤـاندن: ۱. نیشـان دان؛ نمـان؛ شـاندان؛ دای نیشان ۲. دەرخستن؛ ئاشـکرا کـردن؛ وسـتەی سارا. هەروەها: **نمایاندنی**

■ صفت فاعلی: **نماینده** (ڕانوێنەر)/ صفت مفعولی: **نمایانـده** (ڕانـوێنراو)/ مصـدر منفـی: **نَنمایانـدن** (ڕانەنواندن)

**نمایانگر** / nemāyāngar, namā-/: *صفت.* شاندەر؛ نیشاندەر؛ خویاکەر.

**نمایش** / nemāyeš, namāyeš/: *اسم.* نمـایش: ۱. کار و ڕەوتی شـاندان؛ نیشـاندان؛ پیشـاندان ‹نمایش بدن لخت: نمایشی لەشی ڕووت› ۲. ڕانان؛ کارێک بۆ سەرنج ڕاکێشـانی خەڵـک ‹خـودش را نمایش می‌دهد: خۆی ڕادەنێ› ۳. شـانۆک؛ شـانۆ؛ هونەری ڕانانی چـیرۆک و ڕووداوان ‹هنرپیشـەی نمایش: شانۆیاری شانۆک› ٤. /ـها؛ ـات/ شانۆ؛ کـار یـا ڕەوتی بـەڕێوە بـردن و هێنانـە سـەر نیـاری شانۆک ‹اجرای نمایش: بەڕێوە بردنی شانۆ›.

▣ نمایش تراژدی ☜ **تراژدی ـ ۱**

نمـایش تشـدید مغناطیسـی: .M.R.I، شـێوە کارێک بۆ دیتنی ناوەوەی ئەندامانی لەش.

نمایش روحوضی: شانۆی ڕووحەوزی؛ شـانۆی کـۆنی زۆرتـر گاڵـتە و حەنـەک بـە سـاز و ئاوازەوە، تایبەتی زەمـاوەن جێـژن و میـوانی گەورە.

نمایش عروسکی: بووکەشانۆ؛ شـانۆی وەویلـە؛ هەر کام لە شێوە جۆراجۆرەکانی شـانۆگێـڕان بە وەویلکە و لەیستۆک.

▣ نمایش دادن: نیشان دان؛ خستنە بەر چاو.

بە نمایش گذاشتن: ڕانان؛ نوانـدن؛ پیشـاندان؛ نیشان دان؛ شاندان.

**نمایش‌سرا** / nemāyeššarā, namāyeš- ، ـها/: *اسم.* شـانۆخانە؛ تماشـاخانە؛ یانـەی شـانۆک؛ تەلاری تەئاتر.

**نمایشگاه** / nemāyešgāh, namāyeš- ، ـها/: *اسم.* نمایشگا؛ پیشانگە؛ نیشانگە؛ ڕانگە؛ تەواشـاخانە؛

جێگەی ڕانان ‹نمایشگاه اتومبیل؛ نمایشگاه نقاشی: نمایشگای ماشین؛ پیشانگەی نەقاشی›.

**نمایشگر** / nemāyešgar, namāyeš- ، ـان/:اسم. ١. شانۆکار. هەروەها: **نمایشگری** ٢. نیشاندەر؛ مانیتۆر؛ شاشە؛ پەڕەی شاندان.

**نمایشنامه** / nemāyešnāme, namāyeš- ، ـها/:اسم. شانۆنامە؛ چیرۆکی شانۆ ‹نمایشنامەی هملت روی صحنه است: شانۆنامەی هاملت لە سەر نیارە›.

**نمایشنامەنویس** / nemāyešnāmenevîs, namāyeš- ، ـها؛ ـان/:اسم. شانۆنامەنووس؛ ئەو کەسەی چیرۆک بۆ شانو دەنووسێ ‹شکسپیر نمایشنامەنویس نامدار انگلیسی: شکسپیر شانونامەنووسی بەناوبانگی ئینگلیسی›.

**نمایشی** / nemāyešî, namāyešî/: صفت. شانۆیی؛ سەر بە شانۆ ‹هنرهای نمایشی: هونەرگەلی شانویی›.

**نمایندگی** / nemāyandegî, namāyandegî/: اسم. نوێنەرایەتی؛ بریکاری: ١. کاری نوێنەر ‹نمایندگی تهران را داشت: نوێنەرایەتی تارانی هەبوو› ٢. چۆنیەتی و دۆخی بریکار بوون ‹بە نمایندگی انتخاب شد: بۆ بریکاری هەڵبژێردرا› ٣. /ـها/ نووسینگە و شوێنی کاری نوێنەر ‹نمایندگی فروش چرخ خیاطی: نوێنەرایەتی فرۆشی چەرخی دروومان›.

**نماینده** / nemāyande, namāyande ، ـها؛ ـگان/: اسم. نوێنەر؛ بریکار؛ جێدار؛ نوێنە؛ نووینە؛ بەرکەیە: ١. ئەو کەسە لە لایەن دەستە، تاقم یان کۆمەڵێکەوە بۆ بەشداری لە کۆڕ، ئەنجومەن یان لێژنەیەک هەڵدەبژێردرێ تا دەمڕاست و پارێزەری بەرژەوندی وان بێ ‹نمایندەی مجلس: نوێنەری ئەنجومەن› ٢. ئەو کەسە لە لایەن کەس یان دامەزراوەیەکەوە بۆ خزمەت بە خۆیان هەڵدەبژێردرێ ‹نمایندەی بازرگانی؛ نمایندەی سیاسی: نوێنەری بازرگانی؛ بریکاری رامیاری›.

**نمایه** / nemāye, namāye ، ـها/:اسم. ناونامە؛ پێڕستێ لە ناوی کەسان، جێگاکان و... کە بە گوێرەی دوزەنەیەکی تایبەتی (وەک ڕیزی ئەلفوبێ) لە سەرەتا یان زۆرتر لە دوایی کتێبەوە دێ.

**ـ نمایی** / nemāyî, namāyî/: پیواژە. ـ نوێنی؛ ـ نمایی؛ ـ نوایی؛ ڕانان؛ نواندن ‹خودنمایی؛ درشتنمایی: خۆنوێنی؛ درشتنمایی›: **ـ نمائی**

**نمبند** / namband ، ـها/:اسم. نمگر؛ شێگر؛ ماک یان بەرهەمێک بۆ بەرگری لە نم.

**نمچینی** / namčînî/:اسم. نمکێشی؛ نمچنی؛ دۆخی هەڵمژینی هەڵم و بۆقی هەوا لە بڕێ شتدا.

**نمد** / namad ، ـها/:اسم. لباد؛ لبا؛ لوا؛ لۆپ؛ لەوا؛ لەبو؛ نەوگ؛ نەوو؛ نمەد؛ لمەد؛ کولاو؛ کولاڤ؛ تات؛ تاتی؛ یان؛ تەحت؛ لێی: ١. بەرگنی پەستواو بۆ ڕایەخ، فەرەنجی، کڵاو و... ٢. مووکیت یان قوماشئاسایەک کە بە ڕیشاڵی دەسکرد و لە کارخانە دروست دەکرێ.

⊡ نمدی آفتاب کردن: [مجازی] پایەک داکێشان؛ وچانێک دان؛ هەل و دەرفەتێک بۆ حەسانەوە دەس خستن.

از این نمد کلاهی رسیدن: [مجازی] لەم خەرمانە خەلەیەک بردن؛ لە بەرهەم و داهاتی کارێک بەش بردن ‹حواست باشد به ما هم از این نمد کلاهی برسد: وریا بە ئێمەش لەم خەرمانە خەلەیەک بدرێ›.

**نمدار** [1] / namdār/ ☜ **زیرفون**

**نمدار** [2]: صفت. [گفتاری] نماوی؛ نمدار؛ شێدار؛ شەدار؛ نمسار؛ هیتە؛ هووتن؛ شۆدار ‹پارچەی نمدار: قوماشی نماوی›.

**نمدزین** / namadzîn ، ـها/:اسم. نەرمەزین؛ وەرزین؛ نمەدزین؛ مەعرەکە؛ گردەڵە؛ ئارەقگیری بن زین.

**نمدمال** / namadmāl ، ـها؛ ـان/:اسم. بگێڕ؛

نەوگ‌مال؛ کەچەچی؛ لەبوچی؛ کولاف‌کەر؛ ئەو کەسەی بەرگن دەپەستێوی و دەیکاتە لبار.
هەروەها: **نمدمالی**

**نمدی** / namadî ، ـها/: *صفت.* لبادی؛ نەوگی؛ نەمەدی؛ کولاوی؛ تەحتی: ۱. لە نەمەد ‹کلاه نمدی: کلاوی لباوی› ۲. وەک نەمەد ‹موکت نمدی: موکیتی نەمەدی›.

**نمرات** / nomarāt/: [معرب] جمعِ ☜ **نُمره**

**نمردن** / namordan/ ☜ **مردن**

**نمره** / nomre ، ـها؛ نُمرات/: [معرب از ایتالیایی]/*اسم.* نمره: ۱. ژماره ‹نمره‌ی عینک: ژمارەی چاویلکە› ۲. نیشە؛ ژمارەیێ کە ڕادەی زانیاری، فێرکاری یان لێهاتوویی خوێندکاران نیشان دەدا ‹نمره‌ی ادبیاتش همیشه ۲۰ بود: نمرەی ویژەی هەموو جارێک ۲۰ بوو›.

◙ **نمره‌ی تک**: نمرەی تەک؛ نمرەی ژێر ۱۰.

◘ **نمره آوردن**: نمره هێنان/ هاوردن/ گرتن؛ نیشە هێنان ‹در هنر نمره نیاورد: لە هونەردا نمرەی نەهێنا›.

**نمره دادن**: نمرە دان: ۱. دیاری‌کردنی نمرەی وانە ‹نمره‌ی همه‌ی بچه‌ها را داده‌ام: نمرەی هەموو قوتابیانم داوە› ۲. پێدانی نمرەیەک زۆرتر لەو ڕادەیە کە شیاوی خوێندکار یان قوتابیە ‹فشار آوردند که به او نمره بدهم: زۆریان هێنا نمرەی پێ بدەم›. هەروەها: **نُمره گرفتن**

**نمس** / nems ، ـها/: [عربی]/*اسم.* بانەوانک؛ بان‌بانکە؛ بانبانک؛ مریشکخۆرە؛ گیانەوەرێکە وەکوو دەڵەک، بە قەد پشیلەیەک، مریشک و مار و هێلکە دەخوا.

**نم‌سنج** / namsanc ، ـها/: *اسم.* نم‌پێو؛ شێ‌پێو: **رطوبت‌سنج**

**نمط** / namat ، ـها/: [عربی]/*اسم.*/*[ادبی]* شێوە؛ شێواز؛ تەرز؛ پێ‌ودان؛ زێ ‹گر تو قرآن بدین نمط خوانی/ ببری رونق مسلمانی: ئا بەم شێوە ئەتۆ قورئان بخوێنی/ موسوڵمانیش لە دینی دەتارێنی›.

**نمک** / namak/: *اسم.* خوێ؛ نمەک؛ مەک؛ مەکی: ۱. خێ؛ خوا؛ خوە؛ خوەی؛ پێکهاتەیەکی بلۆری لە کلورووری سودیوم، بە ڕەنگی سپی و تامی سوێرەوە کە بە زۆری لە سروشتدا دەست دەکەوێ و تامێ چێشتە: **نمک طعام** ۲. /ـها/ *[شیمی]* هەر یەکە لەو ماکانەی لە کاردانەوەی نێوان ئەسید و بازدا بەرهەم دێن ۳. *[مجازی]* تام؛ دانستە و چۆنیەتێکی لەبار و بەردڵ، کە حەز و سەرنجی خەڵک ڕادەکێشێ.

◙ نمک طعام ☜ **نمک ـ۱**

◘ نمک بر/ به زخم کسی پاشیدن: *[کنایی]* زام/ برینی کەسێک کولاندنەوە؛ لە سەر زگی کەسێ هەڵپەڕین؛ زۆرترکردنی ئازار و ڕەنجی کەسێک ‹نخواستم نمک بر زخمش بپاشم: گەرەکم نەبوو زامی بکولێنمەوە›.

نمک پاشیدن: خوێ‌کردن؛ خوێ پێوەکردن؛ مەک‌کەردەی/ شەی/ شانای؛ خوێ/ نمەک پژاندن.

نمک خوردن و نمکدان (را) شکستن: *[کنایی]* نان خواردن و سفرە دڕین؛ ئاو واردەی و گۆزەڵێ مارەی؛ ناسپاسی‌کردن.

نمک داشتن: *[مجازی]* بەتام و خوێ بوون؛ مەکین بیەی؛ دلگر بوون؛ لە بەر دلان بوون.

نمک ریختن: *[تعریض]* خۆ بێ‌تام‌کردن؛ گاڵتەی نابەجێ و بێ‌مانا کردن.

نمک زدن: نمەک/ خوێ پێوەکردن؛ خوێ لێدان؛ خوێ‌کردن ‹نمک بزنی خوشمزه‌تر می‌شود: خوێی سوێ بکەی خۆشتر دەبێ›

**نمکاهی** / namkāhî/: *اسم.* کزری؛ دۆخی کەم بوونەوەی تەڕایی زەوی بە هۆی هەڵم و بۆقی گژ و گیا.

**نمک‌به‌حرام** / namakbeharām ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* *[گفتاری]* نمەک‌بەحەرام؛ نمەک‌کوێر؛ سپڵە؛ بێ‌ئەمەگ؛ بەدنمەک؛ پێ‌نەزان.

**نمک‌پاش** / namakpāš ، ـها/: اسم. خوێدان؛ خوادان؛ نمەکدان؛ دەفری چکۆلەی زۆرتر گرۆڤەری بە کلاوەی کون ـ کونەوە، بۆ خوێ پێوە کردن.

**نمک‌پرورده** / namakparvarde/: اسم. نانخۆر؛ نمەک‌پەروەردە؛ ئەوەی بۆ ماوەیەک میوانی دلۆڤانی، چاکە و میوانداری یەکێکی‌تر بووبێت.

**نمکخواه** / namakxāh/ ☜ **نمکدوست**

**نمکدان** / namakdān ، ـها/: اسم. خوێدان؛ نمەکدان؛ مەکدان؛ خوێدانک؛ خوادان؛ دەفری چکۆلەی جێ خوێ بۆ سەر سفرە.

**نمکدوست** / namakdûst/: صفت. *[گیاه‌شناسی]* خوێواز؛ نمەکواز؛ لێهاتوو بۆ هەڵکردن و گەشە کردن لە شۆرەزاردا: **نمکخواه**

**نمکرده** / namkarde ، ـها/: اسم. *[گفتاری]* ماشقە؛ دۆس؛ کچ یان ژنێ کە بە نهێنی هاوجێی پیاوێ دەکا.

**نمکزار** / namakzār ، ـها؛ ـان/: اسم. خێبەندان؛ خوێڵێن: ١. دەشتێ (وەکوو تەختایی رووبار یان گۆمێکی وشکەوبووی کۆن) کە خوێ داپۆشیوە ٢. شۆرەکات؛ شۆرەک؛ شۆراخ؛ شۆرەزار؛ شامات؛ دەشتێ کە خاکەکەی خوێی تێدایە.

**نمک‌سنج** / namaksanc ، ـها/: اسم. خوێ‌پێو؛ نمەک‌پێو؛ کەرستەیەک بۆ هەڵسەنگاندنی رێژەی خوێ لە نموونەیەکدا.

**نمکسود** / namaksûd/: صفت. خوێکراو؛ نیم‌نمەک؛ نمەک لێدراو؛ خوێ پێوەکراو (خۆراک) بە مەبەستی نمچن‌کردن و بەرگری لە سەرهەڵدان و گەشەی میکرۆب.

**نمک‌گیر** / namakgîr/: صفت. نمەک‌گیر؛ گیرۆدە بە هۆی ئەمەگناسی لە ئاست چاکەی کەسێکدا.

**نمک‌نشناس** / namaknašnās ، ـها؛ ـان/: صفت. *[گفتاری]* نمەک‌نەناس؛ نمەک‌کوێر؛ نمەک‌مەشناس؛ ناسپاس؛ سپڵە؛ بێ‌ئەمەگ؛ پێ‌نەزان.

**نمکی** / namakî ، ـها/: اسم. *[گفتاری]* کۆنەسێن ‹این خرت‌وپرت‌ها را بده نمکی ببرد: ئەم خرووپرانە بدە کۆنەسێن بیبا›.

**نمکی**: صفت. ١. سوێر؛ سوێڵ؛ شۆر ٢. بە هۆی لە ناو خوێدا بوون، وەک خوێ هەڵگەڕاو ٣. *[گفتاری]* مەکین؛ نمەکین؛ خوێن‌شیرین؛ ڕەزاسووک.

**نمکیدن** / namekîdam, namakîdan/ ☜ **مکیدن**

**نمکین** / namakîn/: صفت. *[ادبی]* نمەکین؛ خوێن‌شیرین؛ لەبەردڵان؛ مەکین؛ جوانی دڵکێش.

**نمگیر** / namgîr/: اسم. نمگر؛ شێگر؛ بە تایبەتمەندی گرتنی نمەوە: **رطوبت‌گیر**

**نمگیری** / namgîrî/: اسم. نمگری؛ شێگری؛ کار و ڕەوتی هەڵمژین و وەخۆ گرتنی ئاو و هەڵمی دەور و بەر: **رطوبت‌گیری**

**نمناک** / namnāk/: صفت. شێدار؛ نماوی؛ نمسار؛ نمدار؛ نمین؛ نمرچ؛ شەدار؛ شۆدار؛ هیوی؛ نمناک ‹اتاق نمناک؛ لباس نمناک؛ دیوی نمدار؛ جلی نماوی›.

**نم ـ نم** / namnam/: اسم. نمە ـ نمە؛ نم ـ نم؛ نمەنم؛ نم‌نمە؛ نمەناز؛ نمەنوڵ؛ ڕەشێش؛ خوناوکە؛ خوناڤ؛ خوناو؛ وەشت؛ تووکە؛ ڕشێنە؛ تووکەتووک؛ بارشتی کەم‌کەم و لەسەرخۆ ‹نم ـ نم باریدن: نمە ـ نمە بارین›.

**نم‌نما** / namnemā ، ـها/: اسم. شێ‌نوێن؛ ئامرازێک بۆ پیشان دانی ڕادەی نم و بان و خوار کردنی لە هەوادا.

**نم‌نمک** / namnamak/: قید. نەرمە ـ نەرمە: ١. هێدی ـ هێدی؛ ئارام ـ ئارام ‹نم‌نمک صدای تاری می‌آمد: دەنگی تارێک نەرمە ـ نەرمە دەهات› ٢. لەسەرخۆ؛ بە ئارامی؛ بە ئەسپایی؛ وەسپایی؛ شێنەی؛ وەش ـ وەش؛ بە هێدیکایی ‹نم‌نمک

می‌رفتیم: لەسەرخو دەچووین›.

**نمو** / nemov(v)/: *اسم.* گەشە؛ وەرار: ١. خیف؛ خێزیان؛ فەراژی؛ فراژی؛ ڕەوتانەی گەورە بوون؛ هەراش بوون؛ گەشە کردن؛ گر بوون؛ فراژ بوون؛ هەڵدان؛ بووژان؛ بە خۆدا هاتن؛ سەر دەرهێنان و بالا کردن ‹نمو درخت: گەشەی دار› ٢. زۆر بوون؛ زیا کردن؛ پەرە سەندن ‹نمو جمعیت: زۆر بوونی جەماوەر›.

**نمود** / nemûd, nomûd/: *اسم.* نموود؛ نموو: ١. ڕەوتی کەوتنە بەرچاو؛ دەرکەوتن و سەرنجڕاکێش بوون ‹به تدریج کارش نمود پیدا کرد و دیگران متوجه ارزش آن شدند: نەختە ــ نەختە کارەکەی نموودی هێنا و خەڵک بایەخیان زانی› ٢. بەرچاوی؛ سەرنجڕاکێشی ‹اینجا نمود ندارد باید بالاتر برود: لێرە بەرچاوی نیە دەبێ بچێتە سەرترەوە›.

**نمودار** [1] / nemûdār، ـها/: *اسم.* ١. خشتە؛ نوانە؛ گەڵاڵەی خەتی بۆ دەربڕینی پێوەندی نێوان پاژگەلی گەڵاڵەیەک ٢. **شاخص ــ١**

**نمودار** [2]: *صفت.* ١. نوێنەر؛ نیشاندەر؛ پیشاندەر؛ شاندەر؛ ناسێنەر ‹این عمل نمودار بزدلی است: ئەمکارە نیشاندەری ترسەنۆکیە› ٢. دیار؛ ئاشکرا؛ خویا؛ بەرچاو.

**نمودن** / nemûdan, nomûdan/: *مصدر. متعدی. لازم. [ادبی]* // **نمودی**: نواندت؛ **می نمایی**: دەنوێنی؛ **بنما**: بنوێنە// □ *متعدی.* ١. نواندن؛ نیشاندان؛ پیشاندان؛ شاندان؛ لە بەرچاو ڕانان؛ مۆژنایش؛ ئرمانەی ‹راه نمودن: ڕێگا نواندن› □ *لازم.* ٢. دان؛ کردن ‹سعی نمودن: هەوڵدان›.

هەروەها: **نمودنی**

■ **صفت فاعلی: نماینده** (نوێنەر)/ **صفت مفعولی: نموده** (نوێنراو)/ **مصدر منفی: نَنمودن** (نەنواندن)

**نمور** / namûr/: *صفت. [گفتاری]* نمین؛ نمناک؛ نمدار؛ شێدار؛ نمسار؛ شۆدار؛ هوتن.

**نمونک** / nemûnak، ـها/: *اسم.* ماکێت.

**نمونه** [1] / nemûne, nomûne، ـها/: *اسم.* نموونە؛ نمانا؛ نموودە؛ نمینە؛ نمانە؛ نەموچ؛ نمووج؛ نمووچ؛ نەمووش: ١. پاژ یان ڕێژەیەک لە کۆمەڵێ، بۆ پیشاندان و لێکدانەوەی چۆنیەتی کۆمەڵەکە ‹برایمان نمونه بیاورید تا بررسی کنیم: نموونەمان بۆ بێنن تا لێکی دەینەوە› ٢. کەس یان شتێک کە ناسێنەری تاقم، دەستە یان جۆرێکی دیاریکراوە ‹نمونەی انسانیت: نمانەی مرۆڤایەتی› ٣. بەشێکی کەم لە جەماوەرێکی ئاماری کە لە دانستەکانی دەکۆڵنەوە تا ئەمجار لەمەڕ گشت کۆمەڵەکەوە زانیاری دەست بخەن ‹نمونەی آماری: نمانەی ژمێرکۆیی› ٤. ئەو شتە وا کۆمەڵە شتێکی هاوجۆری لە ڕوو دروست دەکەن ‹این کفش‌ها را از روی نمونەی ایتالیایی دوختەایم: ئەم کەوشانەمان لە ڕووی نموونە ئیتالیاییەکەی دووریوە› ٥. دەقێک لە نووسراوی پیتچن‌کراو بۆ هەڵەگرتن ‹نمونەی اول خیلی پرغلط است: نموونەی یەکەم هەڵەی زۆرە›.

**نمونه** [2]: *صفت.* وێنە؛ نوێنەک؛ نمێنەک؛ گرۆبەر؛ سەرمەشق؛ خاوەن تایبەتمەندیەکی وا کە ببێتە پێوەر بۆ دیتران ‹زن نمونه: ژنی نموونە›.

**نمونەبرداری** / nemûnebardārî، ـها/: *اسم. [پزشکی]* نموونەهەڵگری؛ بیوپسی؛ کار و ڕەوتی هەڵگرتنی پاژێکی پچووک لە شانەیەکی زیندوو (وەک ئێسک، ماسوولکە و...) بۆ تۆژینەوەی ورد و جێ‌متمانە.

**نمونەخوان** / nemûnexān، ـها؛ ـان/: *اسم.* هەڵەچن؛ هەڵەگر؛ ئەوەی نموونەی چاپی دەخوێنێتەوە و هەڵەکانی لێدەگرێ. هەروەها: **نمونەخوانی**

**نمونەگیری** / nemûnegîrî، ـها/: *اسم.* نموونەگری: ١. کار و ڕەوتی کۆکردنەوەی هێندێک نموونە لە ئەندامانی کۆمەڵەیەک بۆ لێکدانەوەی دانستەکانی ئەو کۆمەڵە ٢. *[پزشکی]* کاری هەڵگرتنی نموونەیەک لە خوێن، میز

و...ی نەخۆش بۆ تاقیکاری بژیشکی.

**نمونه‌وار** / nemûnevār/: *صفت*. وەک نموونـە؛ بۆ نموونه ‹چند مورد را نمونه‌وار ذکر می‌کنم: چەند بابەت وەک نموونە ناو دەبەم›.

**نمیراندن** / namîrāndan/ ☜ **میراندن**

**نازیدن** / nanāzîdan/ ☜ **نازیدن**

**نالیدن** / nanālîdan/ ☜ **نالیدن**

**نر** / nonor ، ـها/: *صفت*. بیـانووگر؛ بیـان‌کـواز؛ بیانگ‌واز؛ گوێ‌نـەبیس و وازوازی بـە هـۆی بـە دەمەوە دانی دیتران.

**نشاندن** / nanešāndan/ ☜ **نشاندن**

**نشستن** / nanešastan/ ☜ **نشستن**

**ننگ** / nang ، ـها/: *اسم*. شـوورەیی؛ شـوورە؛ کەترە؛ سەرشۆڕی؛ نەنگ؛ عـەیب؛ عـار؛ مایـەی ئابڕوو چوون.

▣ **ننگ آمدن**: *[گفتاری]* پێ عەیب بوون؛ شـەرم هاتن ‹ننگش می‌آمد بگوید از چه خانواده‌ای است: پی عەیب بوو بێژێ لە چ بنەماڵەیەکە›.

ننگ بستن: تۆمـەت دان؛ ناونیتکـە لـێ‌دان/ لێ‌نان.

ننگ داشتن: شـەرمەزار بـوون؛ خەجاڵـەت کێشان.

ننگ کردن: کـەتن‌کـردن؛ کـاری ناشـیرین و ئابڕووبەرەکردن.

**ننگ‌آور** / nangāvar/ ☜ **ننگین**

**ننگاشتن** / nanegāštan/ ☜ **نگاشتن**

**ننگبار** / nangbār/ ☜ **ننگین**

**ننگریستن** / nanegarîstan/ ☜ **نگریستن**

**ننگین** / nangîn/: *صفت*. نـەنگین؛ ئابڕووبـەر؛ ئابڕووبـەرە؛ ناشـیرین؛ هـۆی شـەرمەزاری، سەرشۆڕی و بێ‌ئابڕوویی ‹عمل ننگین: کـردەوەی نەنگین›. هەروەها: **ننگ‌آور؛ ننگبار**

**ننمایاندن** / nanemāyāndan/ ☜ **نمایاندن**

**ننمودن** / nanemûdan/ ☜ **نمودن**

**ننو** / nanû ، ـها/: *اسم*. هـەلۆرک؛ هەلۆرکـە؛ هالێن؛ چەمچیر؛ لەیلوک؛ دەیـدەک؛ دەیـدیک؛ لەلوو؛ لەلۆ؛ لەلوک؛ لـەلوە؛ لـەیلوێ؛ دەرگـوش؛ دەرگـووش؛ دەرگوشـک؛ جـێ ڕاکشـان و نووستنێکی زۆرتر لە پارچە کە بـە تەنافـەوە لـە نێوان دوو دار یان دوو کۆڵەکەی هەڵدەبەستن.

**ننواختن** / nanavāxtan/ ☜ **نواختن**

**ننوردیدن** / nanavardîdan/ ☜ **نوردیدن**

**ننوشاندن** / nanûšāndan/ ☜ **نوشاندن**

**ننوشتن** / naneveštan/ ☜ **نوشتن**

**ننوشیدن** / nanûšîdan/ ☜ **نوشیدن**

**ننه** / nane ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* دایـە: ١. دایـک؛ داک؛ دالک؛ ئەدا؛ مـاک؛ مـادەر ٢. نەنـە؛ ئانـە؛ ئامە؛ ماما؛ دایەگـەورە؛ دایکـی دایـک یـا بـاوک ٣. خزمـەتکاری ژن، بەتایبـەت سـاڵ بەسـەردا چوو ٤. دایەپیرە؛ نازناوێک بۆ ژنانی پیر.

**ننهادن** / nanahādan, nanehādan/ ☜ **نهادن**

**ننهفتن** / nanehoftan, nanahoftan, nanohoftan/ ☜ **نهفتن**

**ننه‌قمر** / naneqamar ، ـها/: [فارسی/ عربی]/*اسم. [کنایی]* باجی‌کڵاو؛ باجی شلپیتاو؛ باجی شرپینە: ١. ڕوو هەڵماڵـیاگ؛ ژنی بـێ‌حـەیا ٢. هـەرچی پەرچی؛ هەرکەسێکی خوێڕی و بەرەڵا.

**ننه‌مرده** / nanemorde ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* دایـکمـردوو؛ دایـکمـردگ؛ ئەدامـەردە؛ بەستەزمان؛ بەدبەخت؛ دامـاو؛ بـێ‌دەرەتـان ‹آن ننەمردە کە تقصیری نداشت: ئـەو دایـکمـردووە خـۆ تاوانێکی نەبوو›.

**ننه‌من‌غریبم** / nanemanqarîbam/: [فارسی/ عربی/ فارسی]/*اسم. [تعریض، گفتاری]* مووسایی‌بازی.

▣ ننـەمـن‌غـریبم درآوردن: مووسـاییبـازی دەرهێنان؛ خۆ لە کزی و هـەژاری دان ‹متهم یک ننه من غریبمی درآورد که همه به گریـه افتادند: تاوانبارەکە مووساییبازیەکی دەرهێنا گشتی کـردە گریانەوە›.

**نو**[1] / now, no: ، ـها/: *صفت*. نوێ؛ نۆ؛ نـەو؛ نـوو؛

نفت؛ نڤار؛ نووی؛ نوه ؛ نووڤ؛ تازه: ۱. چێ‌کراو، دابین‌کراو یان ناسراو له ماوه‌یه‌کی نزیکدا ‹خانه‌ی نو: مالی نوی› ۲. بێ‌هاومال له ڕابردوودا ‹سبک نو: شێوازی نوی› ۳. ئه‌و شته‌ی به هۆی کاره‌وه خراپ نه‌بووبێ ‹قالی هنوز نو است: قالیه‌که هێشتا نوییه›.

▣ از نو: سه‌ر له نوێ؛ له نوو؛ ژ نوو؛ نۆز؛ نۆژه‌ن؛ دیسا؛ ئێدن؛ له سه‌ره‌وه؛ له سه‌ره‌و؛ هه‌م؛ له هه‌وه‌ڵه‌وه؛ دیسان؛ دیسانه‌وه؛ هه‌میسان؛ هه‌مدیس ‹از نو بخوان: سه‌ر له نوی بخوێنه‌وه›.

▣ نو شدن: نوێ بوونه‌وه؛ تازه بوونه‌وه؛ تازه‌وه بیه‌ی.

نو کردن: نوێ‌کردنه‌وه؛ تازه‌کردنه‌وه؛ نوێ کرن؛ شتێکی نوێ هێنانه جێی کۆن ‹لباسش را نو کرده بود: جلک‌وبه‌رگی نوی کردبوو›.

**نو ـ**[۲]: *پیشوازه.* نۆ ـ ؛ نوێ ـ ؛ نوو ـ ؛ ـ نێن؛ تازه ـ : ۱. به تازه‌یی؛ تازه به تازه ‹نوبهار: نوبه‌هار› ۲. تازه‌دانراو ‹نوبنیاد: تازه‌دانراو›.

**نوآموز** / nowāmûz, -'āmûz ، ـها؛ ـان/: *اسم.* نۆمس؛ ئه‌وه‌ی تازه فێر بوونی کارێک ده‌ست پێ‌ده‌کا.

**نوآوری** / nowāvari, -'āvari ، ـها/: *اسم.* داهێنه‌ری؛ نۆژه‌نی؛ کار و ڕه‌وتی داهێنان؛ داهاوردن؛ داهانین؛ وه‌دی هێنانی شتی نوێ.

هه‌روه‌ها: **نوآور**

**نوآیین** / nowāyîn, -'āyîn/: *صفت.* ۱. تازه‌ڕازاو؛ خاوه‌ن جوانکاری نوێ ۲. نۆئایین؛ نۆدین؛ خێوی دینی نوێ.

**نوا** / navā ، ـها/: *اسم.* نه‌وا: ۱. *[موسیقی]* یه‌کێک له حه‌وت ده‌زگای مۆسیقای ئێرانی ۲. *[ادبی]* چریکه؛ نه‌غمه؛ ده‌نگ و ئاواز ‹نوای موسیقی: نه‌وای مووسیقا› ۳. *[ادبی]* نان و به‌رگ؛ پێداویستی ژیان.

▣ به نوایی رسیدن: گه‌یشتنه نان و به‌رگێک/ ئاوێک؛ تیکه نانێک ده‌ست که‌وتن.

**نواب** / novvāb/: [عربی] جمعِ ☜ **نایِب**

**نوابغ** / navābeq/ [عربی] جمعِ ☜ **نابِغه**

**نواحی** / navāhî/ [عربی] جمعِ ☜ **ناحیه**

**نواخت** / navāxt/: *اسم.* نه‌وانی: ۱. شێوه؛ بار و دۆخێکی دیاریکراو ۲. *ـها/ [موسیقی]* ☜ **ضرب ـ ۶**

**نواختر** / nowaxtar, -'axtar ، ـها؛ ـان/: *اسم.* نۆئه‌ستێر؛ هه‌ر کام له‌و ئه‌ستێرانه‌ی له کوتوپڕا تیشکیان زۆر ده‌کا و پاش چه‌ند مانگ وه‌ک خۆیان لێ دێته‌وه.

**نواختن** / navāxtan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **نواختی**: ژه‌ندت؛ **می‌نوازی**: ده‌ژه‌نی؛ **بِنواز**: بژه‌نه // ۱. ژه‌ندن؛ ژه‌نین؛ ژه‌نن؛ ژه‌نه‌ی؛ لێدان؛ داونه‌ی؛ ده‌نگ ده‌رهێنان له ئامێری مۆسیقاوه ‹تار نواختن: تار ژه‌ندن› ۲. لاواندن؛ لاواندنه‌وه؛ لاونایوه؛ په‌لاندن؛ نه‌وازش‌کردن؛ نازکێشان؛ نازدان؛ ڤه‌خۆندن؛ هه‌وێنایش ‹او را نواخت و در کنار خود نشاند: لاواندیه‌وه و له لای خۆی داینا› ۳. مالین؛ مالاندن؛ دان ‹مشتی چند بر سر و رویش نواخت: چه‌ن مسته‌کۆلێکی مالی به سه‌ر و چاویدا›:

**نوازیدن.** هه‌روه‌ها: **نواختنی**

■ صفت فاعلی: **نوازنده** (ژه‌نیار)/ صفت مفعولی: **نواخته** (ژه‌نراو)/ مصدر منفی: **نَنواختن** (نه‌ژه‌ندن)

**نوادر** / navāder/: [عربی]/ *اسم.* هه‌ڵکه‌وتووان؛ که‌سانی که‌موێنه ‹بوعلی‌سینا از نوادر روزگار بود: بووعه‌لی‌سینا له هه‌ڵکه‌وتوانی ڕۆژگار بوو›.

**نواده** / navāde ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* ۱. نه‌وه؛ پشتی دووه‌م ۲. نه‌بیره؛ نه‌تیژه؛ نه‌ڤی‌چرک؛ نه‌وه‌زازا؛ پشتی سێهه‌م.

**نوار** / navār ، ـها/: *اسم.* شریت؛ شریته؛ تلیمه: ۱. هه‌ودایه‌کی باریک، ته‌خت و زۆرتر نه‌رم له شتێک: *الف)* تیزمالک؛ باریکه؛ ڕووبان؛ ڕیسه؛ باریکه‌یه‌ک له قوماش بۆ ڕازاندنه‌وه‌ی پرچ یان به‌رگ، یا خۆ بۆ جوان به‌ستنه‌وه‌ی شتێک *ب)* برین‌پێچ؛ تیزمالک؛ باند؛ له‌فافه؛ پارچه‌ی

بـاریکی نـەرم و خـاوێن بـۆ بەسـتنی بـرین و شکاوی ج) نـەوار؛ هەودایـەکی باریـک و زۆرتـر پلاستیکی و میغناتیس‌کراو بـۆ تۆمـاری دەنـگ یـان دەنـگ و ڕەنـگ د) [پزشـکی] نـەوار؛ هەودایەکی کاغەزی بۆ تۆمارکردنی زانیـاری بـە شێوەی نوانـە ‹نـوار قلـب؛ نـوار مغـز: شریتـی دڵ؛ شریتەی مێشـک› ۲. هـێڵ؛ پارچـە زەویـەکی باریک، زۆرتر لە لێـوار یـان بـە دەوری شـتێکدا ‹نوار مرزی: هێلـی سنووری›.

▣ **نوار بهداشتی:** لەتـە تیزماڵـکی چـەن‌لـۆ لـە ماکی هەڵمژ (وەک لۆکە و تەنزیف) بۆ لـە خـۆ گرتنی پیسار و بێ‌نوێژی ژنان.

**نـوار تصـویری:** شـریتی ڤـیدیۆیی؛ شـریتی میغناتیسی‌کراو بۆ هەڵگرتنی وێنە و ڕەنگ.

**نوار چسب:** نەوارچەسپ؛ باریکەیەکی یـەک‌لا چەسپ (لە جنسی سیلوولۆز، پارچە، کاغەز یـان پلاستیک) بۆ چەسپکاری وشک.

**نوار خام:** شریتی خاو؛ نەوار خاڵی؛ شریتێ کە هیچی لە سەر تۆمار نەکرابێ.

**نوار صوتی:** شـریتی دەنـگ؛ شـریتێ کـە بـۆ تۆماری دەنگ، میغناتیس کرابێ.

**نوار قلب:** [پزشکی] شـریتی دڵ؛ نـەوار قـەلب؛ شـریتێ کـە جووڵـەی ماسـوولکەکانی دڵ (وەکوو چەنـد هێڵـی بـان و خـوار) لـە سـەری تۆمارکراوە.

**نوار مرزی:** هێڵـی سـنووری؛ باریکەیـەک لـە خاکی وڵاتێک لە سەر سنوور.

**نوار مغز:** [پزشکی] شریتەی مێشک؛ شریتێ کە شەپۆلەکانی مێشک (وەکوو چەند هێڵی بـان و خوار) لە سەری تۆمارکراوە.

▣ **پشـت سـر کسـی نـوار گذاشـتن:** [کنـایی] لـە پشتەسـەر کەسێکەوە قسـەکردن؛ غەیبـەتی کەسێک کردن.

**نـوارپیچی / navārpîčî:** /اسم/. ۱. نـەوارپێچی؛ کاری تیزماڵک تێوەپێچان ۲. برین‌پێچی؛ کار و ڕەوتی بەستنی شوێنی برینداری لەش بە باند.

**نواری / navārî:** /صفت/. شریتی؛ نەواری؛ وەکوو نەوار.

**ـ نواز / navāz:** /پیواژە/. ۱. ـ ژەن؛ ژەنیار ‹نی‌نواز: نەی‌ژەن› ۲. ـ حاوێن؛ ـ لاوێن؛ لاوێنەر؛ نـازدەر ‹گوشنواز: گوێ‌حاوێن›.

**نوازش / navāzeš**، ـها/: /اسم/. نەوازش: ۱. کار و ڕەوتی حاواندنـــەوە؛ لاواندنـــەوە؛ نـــاز دان؛ هـەوێنایش؛ هەڵـس‌وکـەوتی ئاوێتـە لەگـەڵ خۆشەویستی و بەزەیی ‹بچه را نوازش کرد و بوسید و در آغوش گرفت: منداڵـەکەی حاوانـدەوە و مـاچی کرد و لە باوەشی گـرت› ۲. کـاری پەلانـدن؛ بـە ئەسپایی دەست پێدا هێنان.

**نوازشـگر / navāzešgar:** /صـفت/. لاوێنـەر؛ حاوێنـەر: ۱. بـە تایبەتمەنـدی یـان توانـایی لاواندنەوە ‹دست نوازشگر مـادر: دەسـتی لاوێنـەری دایـک› ۲. هانـدەری هەسـتی لاوانـدن ‹سخن نوازشگر: پەیڤی حاوێنەر›.

**نوازنـدگی / navāzandegî:** /اسم/. ژەنیـاری: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی ژەندن ۲. کـار و پیشـەی ژەنیار.

**نوازنده / navāzande**، ـها؛ ـگان/: /اسم/. ژەنیـار؛ سازڤـان؛ سـازبەند؛ سـازژەن: ۱. ئـەوەی لـە سۆنگەی ئامێریکی مووسیقاوە، گۆرانی دروسـت دەکا ۲. بەڕێوەبەری ئاهەنگی مووسیقا.

**نوازیـدن / navāzîdan:** /: مصـدر. متعـدی. [ادبی]
☜ **نواختن**

**نوافلاطونی / nowaflātûnî,-'aflātûnî:** /: [فارسی/ معرب] /اسم/. نوێ ئەفلاتوونی؛ ڕێبازێکی فەلسەفی کە لـە ڕەنگدانـەوەی فەلسـەفەی مەشـشـایی و ڕۆژهـەڵاتی لـە سـەر فەلسـەفەی ئـەفلاتوونی پێکهات و لە ئەسکەندەریە لە سەدەکانی نزیـک بە زایین سەری هەڵدا و دەڵـێ عالـەم هـەموو، تیشـکێک لـە خودایـە و ڕۆح بـۆ لای ئـەو دەگەڕێتەوە.

**نواقص** / navāqes/: [عربی] ۱. جمعِ ☜ **نَقیصه** ۲. جمعِ ☜ **نَقص**

**نواله** / navāle ، ـها/:/اسم. نەواڵە؛ نواڵە؛ بابۆڵە هەویرێ کە بە چوارپێیان بەتایبەت وشتری دەدەن.

**نـوامبر** / novām(b)r/: [فرانسوی]/اسم. نـوامبر؛ نوڤامبر؛ مانگی یازدەهەمی ساڵی زایینی کە ۳۰ ڕۆژە و لە ۱۰ی خەزەڵوەرەوە دەست پێدەکا.

**نوامیس** / navāmîs/: [عربی] جمعِ ☜ **ناموس**

**نوانخانـه** / navānxāne ، ـها/:/اسم. ژارخانە؛ گەداخانە؛ هەتیمخانە؛ کەترەخانە؛ لەنگەرخانە؛ نەوانخانە؛ شوێنی ڕاگرتنی بێماڵ و حاڵان.

**نواندیش** / nowandîš, -'andîš ، ـها؛ ـان/: *صفت.* ڕۆشنبیر؛ زانا بە دابی زەمان؛ تێگەیشتووی پێگەیشتوو ‹آرام انسانی هوشمند و نواندیش است: ئارام مرۆڤێکی هۆشیار و ڕۆشنبیرە›.

**نوئـل** / no'el/: [فرانسوی] ۱. ☜ **کریسمس** ۲. ☜ **بابانوئل**

**نوباوگی** / nowbāvegî/:/اسم. ساوایی؛ ساڤایی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی ساوا بوون ۲. تەمەنی پاش لە شیر بڕانەوە (لە مرۆڤدا) تا نزیک بە پێنج ساڵان.

**نوباوه** / nowbāve ، ـها؛ ـگان/:/اسم. ساوا؛ ساڤا: ۱. منداڵی تازە پێرەوکە تا دەگاتە پێنج ساڵان ۲. *[مجازی]* منداڵ؛ مناڵ؛ زارۆ.

**نوبت** / nowbat, no:bat ، ـها/: [عربی]/اسم. نۆرە؛ نۆبە؛ نۆوە؛ نۆگە؛ نۆب؛ نۆر؛ نۆبەت؛ نەوبە؛ نەوب؛ نەوەتە؛ سووڕ؛ سەرە؛ سڕە؛ سرە؛ بەدیل؛ چەل؛ دەرب؛ گە؛ گەهـ ؛ گەی؛ گیوە: ۱. هەل؛ حەل؛ باو؛ کات یان ماوەیەکی تەرخانکراو بۆ هەر یەک لە ئەندامانی کۆمەڵەیەک بۆ ئەنجامدانی کارێ یان وەرگرتنی ڕاژەیەک ‹جمعەها نوبت نظافت بود: هەینیان نۆرەی خاوێنکاری بوو› ۲. جار؛ کەڕەت؛ ڕا؛ گل؛ گلان؛ دەحە؛ گەلانکە؛ محەل ‹روزی سه نوبت غذا می‌خوریم و یک نوبت کار می‌کنیم: ڕۆژێ سێ جار نان دەخۆین و کەرەتێک کار دەکەین›.

▣ به نوبت ☜ **آسیا به نوبت**

◘ نوبت دادن: نۆرە/ نۆبە/ نۆگە دان؛ دیاری کردنی کات بۆ ئەنجامدانی کارێک ‹ساعت ۱۰ فردا نوبت داده‌اند که بروم دکتر: بۆ ۱۰ی بەیانی نۆرەیان داوە بڕۆم بۆ دوکتور›.

نوبت کسی بودن: نۆرە/ نۆبە/ نۆگەی کەسێک بوون؛ ماف یان ئەرکی کەسێک بوون تا کارێک کە دیاریکراوە ئەنجامی بدا یان بۆی جێبەجێ بکەن ‹نوبت شماست که نان بگیرید: نۆرەی ئێوەیە نان بەرن›. هەروەها: **نوبت کسی شدن**

نوبت کسی گذشتن: نۆرە/ نۆبە/ نۆگەی کەسێک فەوتان/ چوون/ ڕۆیشتن؛ ڕابوردنی ماوەی دیاریکراو بۆ کەسێک ‹دیر آمدید، نوبت شما گذشت: درەنگ هاتنەوە نۆرەکەتان فەوتا›.

نوبت گذاشتن: کردنە نۆرە/ نۆبە/ نۆگە؛ نۆرە/ نۆبە/ نۆگە دانان؛ دیاریکردنی نۆرە ‹نوبت گذاشته‌ایم هر شب یکی از ما کشیک بدهد: کردوومانەتە نۆرە هەر شەوێک و یەکمان کێشک بدا›.

نوبت گرفتن: نۆرە/ نۆبە/ نۆگەگرتن؛ گەی گردن؛ وەسەفیایش ‹از بیمارستان نوبت گرفته‌ام: لە نەخۆشخانە نۆرەم گرتووە›.

**نوبت‌کاری** / nowbatkārî, no:bat- /: [عربی/ فارسی]/اسم. نۆرەکاری؛ نۆبەکاری؛ نۆگەکاری؛ کارێ کە بە پێی سەعاتەکانی ڕۆژ یا ڕۆژەکانی حەفتە نۆرەی دەگۆڕێت.

**نوبتی**[1] / nowbatî, no:batî/: [عربی] *صفت.* نۆرەیی؛ نۆبەیی؛ نۆگەیی ‹کار نوبتی: کاری نۆرەیی›.

**نوبتی**[2]: *قید.* بە نۆرە؛ بە نۆبە؛ بە نۆگە؛ نۆبەیی؛ نۆرەیی ‹نوبتی می‌خوابیم: بە نۆرە دەخەوین›.

**نوبر**[1] / nowbar/:/اسم. نۆبەر؛ نۆبەرە؛ خێوە؛

خیفه؛ خیڤه؛ خیف؛ بالاته؛ ناخوری؛ تانه؛ تەسق؛ تەروەنده: ١. میوەی زووڕەس ٢. میوەیێ کە لە سەرەتای وەرزی خۆیدا دێتە بازاڕ.
▣ **نـوبر چیـزی را آوردن:**[تعـریض] نۆبـەرەی شتێک هێنان؛ شـتێکی نـوێ یـان دەگمـەن ڕانان ‹چه خبـر است؟ مگـر نـوبرش را آوردەای؟!: چخەبەره؟ مەگەر نۆبەرەت هێناوە؟›.
**نوبر کردن:** نۆبەر/ نۆبەرە کردن؛ یەکەم جار لە میوەیەک خواردن ‹امسال هنوز انار نوبر نکردەام: ئەوساڵ هێشتا هەنارم نۆبەر نەکردووە›.
**نـوبر**[٢]: صفت. تـازە؛ نـوێ؛ نـەو؛ کـەبار؛ کوبـار؛ کوباری.
**نوبرانه** / nowbarāne/: صفت. نۆبەر؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی نۆبەرەوە ‹خیار نوبرانه: خەیاری نۆبەر›.
**نـوبلیم** / nobelyom/: [فرانسـوی]/اسم. نوبلیـوم؛ تـوخمی کیمیـایی کـانزایی ڕادیـۆئـەکتیڤ، لـە دەستەی ئاکتنیدەکان بـە ژمـارە ئـەتۆمی ١٠٢، کە بە دەسکرد بەرهەم دێت.
**نوبنیـــاد** / nowbonyād/: صـــفت. نۆبنیـــات؛ تازەبنیات؛ نووچێ؛ تازە دروستکـراو یـان تـازە وەکارکەوتوو ‹دانشگاه نوبنیاد: زانستگای نۆبنیات›.
**نوبه** / nowbe, no:be/: [عربـی]/اسم. ١. ☜ تب نوبه، **تب** ٢. /ها/ نۆرە؛ نۆبە؛ نۆگە؛ سەرە؛ چەل.
**نوبهار** / nowbahār ، ان/:/اسم. نۆبـەهار؛ نۆبـار؛ تازەبەهار؛ سەرەبەهار؛ نۆوەهار؛ نۆبار؛ سـەرەتای وەرزی بەهار.
**نوپا** / nowpā ، ها/: صفت. نۆپێچکە؛ نۆپا؛ نۆپـێ: ١. دارەدارکـەر؛ تـازە پێگرتـوو؛ لـە سـەرەتای پێرەوکـە بـوون ‹کـودک نوپا: منداڵـی نۆپێچکە› ٢. تازە دەست بـە کـار؛ لـە سـەرەتای دەسـت پێکردن یان کار کردندا ‹کشور نوپا: وڵاتی نۆپا›.
**نوپائی** / nowpā'î/ ☜ **نوپایی**
**نوپایی** / nowpāyî/:/اسم. نۆپـایی: ١. دۆخ یـان چۆنیەتی نۆپا بوون ٢. بەرباوشـی؛ بەرمـەمکانی؛ بەرمەمکـەیی؛ نۆپێچکـەیی؛ مـەودای تەمـەنی نێوان یەک تا دوو ساڵ * **نوپائی**
**نوپرداز** / nowpardāz ، ها؛ ان/: صفت. نۆداهێن؛ ئەنجامدەری کاری تازە، بێوێنە یان خاوەن ڕێ و شێوازی نوێ ‹شاعر نوپرداز: هۆنەری نۆداهێن›.
**نوت** / not/: [فرانسوی] ☜ **نُت**
**نوترون** / notron, nutron ، ها/: [فرانسـوی]/اسم. نوترۆن؛ وردیلەی بناغـەیی بـێبـار، هاوسـەنگی پرۆتۆن کە جگە لە هیدرۆژن لە ناوکەی هـەموو توخمەکاندا هەیە.
**نوترینو** / notrîno, nutrîno ، ها/: [فرانسوی]/اسم. نۆترینـۆ؛ وردیلـەی بناغـەیی بـێبـاری یـەکجار سووک کە لانیکەم بە دوو شێوە دەبینرێ.
**نوجوان** / nowcavān ، ها؛ ان/:/اسم. تـازەلاو؛ تـــازەجوان؛ لاجـــک؛ لاوک؛ لاجـــەک؛ لاژەک؛ لاوژۆک؛ لاوژۆکـە؛ نـەوهاڵ؛ لاویـژە؛ نۆجـوان؛ نۆگها؛ نۆچـە: ١. لاوێـژ؛ لاوێـژە؛ کەسـێ تـازە منداڵی ناوەتـە پشـتە سـەر ٢. کەسـێ کـە لـە قۆناخی تازەلاویدایە.
**نوجوانی** / nowcavānî/:/اسم. لاوکی؛ تازەلاوی؛ لاوێژی؛ نەوهاڵی؛ لاویژەیی؛ نۆجوانی؛ نۆچـەیی: ١. سەرەتای تافی لاوی ٢. مەودای تەمەنی ١٣ تا ١٧ ساڵان لە مرۆڤدا.
**نوجوئی** / nowcû'î/ ☜ **نوجویی**
**نوجـــویی** / nowcûyî/: نوێخـوازی؛ تامـەزرۆی دۆزینەوەی شتی تازە و بـێپێشـینە: **نوجـوئی**. هەروەها: **نوجو**
**نـوچ** / nuč/: صـفت.[گفتـاری] دۆچـن؛ لـۆچن؛ شیرەیین؛ لچ؛ چەسپن بە هۆی شیلاوی بوونەوە ‹خربزه خوردم، دستم نوچ شد: کاڵەکم خوارد، دەسـتم دۆچن بوو›.
**نوچـه** / nowče, no:če ، هـا/:/اسم. ١. نۆچـە؛ شاگرد؛ نۆمس؛ بەردەست؛ وەردەست؛ تازەکـار، بەتایبەت لە چالاکی وەرزشیدا ٢. ☜ **شفیره**
**نوحـــه** / nowhe, no:he ، هـا/: [عربـی]/اسم. چەمەری؛ نۆحە؛ سەروە؛ سەردولکە؛ شـیعر یـان

بەستەیەکی شیوەناوی کە لە پرسەدا بە ئاوازەوە دەیخوێنن.

**نوحه‌خوان** / nowhexān, no:he- ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/اسم. نەهاری؛ بلاو؛ سەردولکەبێژ؛ مردوولاوێن.

**نوحه‌خوانی** / nowhexānî, no:he- ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. نەوحەوێژی؛ چەمەرگێڕی؛ کاری نەوحە خوێندن.

**نوخاسته** / nowxāste/: صفت. ۱. /ـها/ تازە پێ‌گەییو؛ تازەبالغ ‹کودک نوخواسته: مندالی تازە پێ‌گەییو› ۲. نۆپا؛ نۆپێ؛ تازە دەست بە کار کردوو ‹کارگاه نوخاسته: کارگەی نۆپا›.

**نود¹** / navad/: اسم. نەوەد؛ نەوەت؛ نەوە؛ ناواری؛ نۆت؛ نۆهەت؛ نۆهەد؛ نەوای؛ نۆتی؛ نەهوێت؛ ژمارەی سەرەکی پێش نەودویەک و پاش هەشتاونۆ.

▣ **بعد از نود و بوقی**: *[تعریض]* دوای سالان و مانگان؛ لە دوای سالێ سلامالێ؛ پاش ماوەیەکی دوور و درێژ ‹بعد از نود و بوقی، یک روز هم که آمده‌ای، می‌خواهی زود بروی؟!: دوای سالان و مانگان رۆژێک هاتووی، دەتهەوێ زوو برۆی؟!›.

**نود²**: صفت. نەوەد؛ نەوەت: ۱. یەکێک زۆرتر لە هەشتاونۆ دانە ۲. نەوەدەم.

**نودم** / navadom/: صفت. نەوەدەم؛ نەوەتەم؛ نۆتەم؛ لە جێگا و پلەوپایەی نەوەددا.

**نودمی** / navadomî ، ـها/: ضمیر. نەوەدەمین؛ ئەوی لە پلە، ڕیز یان جێگای نەوەدەمە.

**نودمین** / navadomîn/: صفت. نەوەدەمین؛ نەوەتەمین؛ نۆدەهەمین؛ نەوایین؛ بە تەرتیب، ڕیز و پلەی نەوەدەمەوە.

**نودولت** / nowdowlat ، ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. *[ادبی]* نۆکیسە؛ نۆبەخت؛ تازەکیسە؛ دەولەمەن چلکن؛ تازەپێداکەوتوو؛ تازەپیاکەوتوو؛ تازەپیاکەفتگ.

**نور** / nûr ، ـها؛ أنوار/: [عربی]/اسم. تیشک؛ نوور؛ تریسک؛ تیژک؛ نیر؛ شۆق؛ شەوق: ۱. ڕۆشنایی؛ ڕووناکی؛ ڕووناهی؛ ڕووژنای؛ پرشنگێ کە دەبێتە هۆی دەرکەوتن و بینینی شت ‹نور خورشید: تیشکی خۆر› ۲. *[فیزیک]* پرشنگی ئەلکترۆمیغناتیسی لە شەبەنگی ژێرسوور تا ژوور بنەوش و تیشکی ئیکس کە بە خێرایی ۳۰۰۰۰۰ کیلۆمیتر لە چرکەدا تێدەپەڕێ ۳. ڕادەی درەوشانەوە ‹این چراغ نور ندارد: ئەم چرایە سۆقی نیە› ٤. سۆما؛ سۆ؛ سۆمایی؛ بینایی؛ هێزی دیتن ‹چشمم کم‌نور شده است: چاوم سۆمای کەم بۆتەوە›.

▣ **نور بالا**: نوور بان؛ نوور بالا؛ تیشکێ (لە ماشێندا) کە دوور ڕوون دەکاتەوە.

**نور پایین**: نوور خوار؛ تیشکێ (لە ماشێندا) کە نزیک ڕوون دەکاتەوە.

**نور خورشید**: تیرێژ؛ تیرەژ؛ ترێژ؛ پرشنگی هەتاو.

**نور دیده**: *[ادبی]* نووری چاو؛ بینایی چاو؛ نووروو چەما: ۱. سۆمای چاو؛ هێزی دیتن ۲. *[مجازی]* زۆر خۆشەویست.

▣ **نور افتادن**: تیشک‌کەوتن ‹نور ماه توی اتاق افتاده بود: تیشکی مانگ کەوتبووە نێو دیوەکەوە›.

**نور انداختن**: شەوق خستن؛ تیشک خستن؛ ڕۆشن‌کردن بە هۆی ناردنی تیشکەوە ‹با چراغ قوه نور انداخت توی صورتم: بە چرا قوە شەوقی خستە نێو چاوانمەوە›.

**نور دادن**: تیشک پێدان؛ نوور پێدان؛ لە بەر نوور ڕاگرتن؛ خستنە بەر تیشک ‹چقدر باید نور بدهم تا عکس ظاهر شود؟: چەندەی نوور پێبدەم تا وێنەکە ڕوون بێتەوە؟›.

**نور دیدن**: تیشک دیتن؛ ڕووناکی دین؛ ڕۆشنایی/ نوور دیتن؛ کەوتنە بەر تیشک ‹مدتها بود نور آفتاب را ندیده بود: لە مێژبوو تیشکی هەتاوی نەدیبوو›.

نور گرفتن: ڕۆشنایی بۆ هاتن؛ تیشک گرتن؛ ڕۆشنایی/ ڕۆژنایی گرتن ‹اتاق از دو پنجره نور می گرفت: دیوەکە لە دوو پەنجەرەوە ڕۆشنایی بۆ دەهات›.

**نورابرق** / nûrābarq/: [عربی] ☜ **فتوالکتریک**

**نورافشان**[1] / nûrafšān ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. چلچرا؛ لووستر.

**نورافشان**[2]: صفت. نووورپرشێن؛ تیشکدەر؛ ڕووناکیدەر؛ بە تایبەتمەندی بڵاوکردنەوەی تیشک.

**نورافشانی** / nûrafšānî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. نووورپرشێنی؛ تیشکدەری؛ کار ڕەوتی تیشکدانەوە؛ بڵاوکردنەوەی تیشک.

**نورافکن** / nûrafkan, -'afkan ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. پروژیکتور؛ چرایەکی کارەبایی پڕ شۆق کە تیشکی تا مەودایەکی کە پێویستە، بڵاوە ناکا.

**نورالژی** / norāljî/: [فرانسوی] /اسم. [پزشکی] نۆرالژی؛ ژانی تاو ـ تاو لە تێپەڕگای یەک یان چەن دەمار، بەبێ هیچ گۆڕانکاریەک لە پێکهاتەی دەمارەکەدا.

**نورانی** / nûrānî/: [عربی] صفت. ١. پرشۆق؛ شۆقدار؛ نووورانی؛ پرشنگدار؛ بەتیشک و بریقە ‹خانه نورانی شده بود: ماڵەکە پرشۆق ببوو› ٢. پیرۆز؛ ممبارەک.

**نورانیت** / nûrānîyyat/: [عربی] /اسم. ١. شۆقداری؛ پڕ تیشکی؛ پرشۆقی؛ دۆخ و چۆنیەتی شۆقدار بوون ٢. پیرۆزی؛ ممبارەکی.

**نورباران** / nûrbārān/: [عربی/ فارسی] صفت. [کنایی] نووورباران؛ نووورواران؛ تیشکباران: ١. زۆر ڕووناک ‹دشت از پرتو ماه نورباران بود: دەشت لە تیشکی مانگ نووورباران ببوو› ٢. نووورپرشێنی؛ بە تیشکدانەوەی زۆر و زەبەند لە چەن لاوە ‹شهر را نورباران کردند: شاریان تیشکباران کرد›.

**نورپردازی** / nûrpardāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. کار و ڕەوتی پۆڕاندن و ڕۆنانی تیشکی لەبار بۆ سەر شانۆ. هەروەها: **نورپرداز**

**نورتاب** / nûrtāb ، ـها/: [عربی/ فارسی] ☜ **آباژور**

**نورترسی** / nûrtarsî/: [عربی/ فارسی] ☜ **نورهراسی**

**نورچشمی** / nûr(e)češmî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. ١. نوور(ی) چاو؛ نووری دیە؛ خۆشەویست؛ کەسی زۆر هێژا و ئازیز ‹نور چشمی را ببوسید: ئەو نووری چاوە ماچ بکەن› ٢. [کنایی] ئازیزباوان؛ ئەو کەسەی لە بەر خزمایەتی لەگەڵ سەرزلان هەمیشە سەر پشکە ‹هر شغل نان و آبداری که باشد مال نورچشمی‌هاست: هەر کارێکی چەور هەبێ هی ئازیزباوانەکانە›.

**نورخان** / nûrxān ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. پاسیۆ؛ ڕۆژنە؛ ڕۆچنە.

**نورد**[1] / navard ، ـها/: /اسم. ١. ☜ **غلتک ـ١** ٢. وەردێنە؛ وەردانە؛ کەسمەبڕ؛ ئامێرێک بۆ پان کردنەوەی هەویری نان.

**ـ نورد**[2]: پیوازه. ـ وان؛ ـ پێو؛ ـ پیم؛ ـ ڤان؛ ئەوەی دەپێوێ ‹کوهنورد: کەژوان›.

**نوردرمانی** / nûrdarmānî/: [عربی/ فارسی] /اسم. [پزشکی] تیشکدەرمانی؛ دەرمانی نەخۆشی بە تیشکی ژێرسوور و ژوورینەوش.

**نوردکاری** / navardkārî/: /اسم. لوولان؛ نوالەکاری؛ کار و ڕەوتی نووشتاندنەوە و بادانی پۆڵا بە تێپەڕاندن لە نێوان چەن گلێندا.

**نوردوست** / nûrdûst/: [عربی/ فارسی] ☜ **نورگرا**

**نوردوستی** / nûrdûstî/: [عربی/ فارسی] ☜ **نورگرایی**

**ـ نوردی** / navardî/: پیوازه. ـ وانی؛ ـ ڤانی؛ ـ پێوی؛ پێوان ‹دریانوردی: زەریاوانی›.

**نوردیدن** / navardîdan/: مصدر. متعدی. [ادبی] // **نوردیدی**: پێوات؛ **می نوردی**: دەپێوی؛ **بنورد**: بپێوە// ١. پێوان؛ پێماین؛ پیڤان؛ پیمەی؛ پیمای؛ گرتنە بەر؛ دانە بەر؛ بە شوێن، ناوچە یان ڕێگایەکدا، لە

شوێنێکەوە بۆ شوێنی‌تر ڕۆیشتن ‹کوه نوردیدن: کێو بڕان›: **درنوشتن** *[ادبی]* ٢. پێچاندنەوە؛ لـوول دان؛ پێچ دان؛ نواله کردن؛ تێوەپێچان؛ پێچنای؛ لوولان؛ بادان؛ پەرپتاندن. هەروەها: **نوردیدنی**
■ صفت مفعولی: **نَوردیده** (پێـوراو)/ مصـدر منفی: **نَنوردیدن** (نەپێوان)

**نورزی** / nûrzî ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت*. *[زیست‌شناسی]* نوورژی؛ تیشکـژی؛ ئاتاجی نـوور بۆ سەر هەڵدان و گەشەکردن.

**نورزیدن** / navarzîdan/ ☜ **ورزیدن**

**نـــورس** / nowras/: *صـــفت*. نـــۆڕەس؛ تازەپێگەیشـتوو: ١. تازەگـەییو ‹میوەی نـورس: میوەی تازەگەییو› ٢. تازەبالغ ‹جوان نورس: لاوی تازەپێگەیشتوو›.

**نورســـاخت** / nûrsāxt/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **فتوسنتز**

**نورسته** / nowraste/: *صفت*. نۆڕسـک؛ تـازەڕواو ‹نهال نورسته: نەمامی نورسک›.

**نورسـنج** / nûrsanc ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/*اسم*. نووڕپێـو؛ تیشـکپێـو؛ ئامرازێـک بـۆ بـەراوردی ڕادەی ڕووناکی.

**نورســـیده** / nowresîde ، ـهـا؛ ـگـان/:/*اسم*. ١. تازەبوو(گ)؛ تیلە؛ منداڵی تازە بـە دنیاهـاتوو ‹قدم نورسیده مبارک: پاوقـامی تـازەبووک مبـارەک› ٢. ئەوەی تازە گەیشتۆتە بەرەوە.

**نورشناخت** / nûršenāxt/: [عربـی/ فارسـی]/*اسم*. ☜ **أپتیک**

**نورشناســـی** / nûršenāsî/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **أپتیک**

**نـــورعلی‌نـــور** / nûr(e)'alānûr/: [عربـی] *صـفت*. *[مجازی]* لە چاک چاکتر؛ لە خاس خاس‌تر.

**نورگرا** / nûrgerā/: [عربی/ فارسی] *صفت*. نووڕواز؛ تیشکـدۆس؛ تیشکەوگر: **نوردوست**

**نـــورگرایی** / nûrgerāyî/: [عربـی/ فارسـی]/*اسم*. *[زیست‌شناسی]* نـووڕوازی؛ تیشـکەوگری؛ گەشـە کردن یان لا کردنەوە بەرەو تیشک، بەتایبەت لە ڕووەکدا: **نوردوستی**

**نـــورگیر**[1] / nûrgîr ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی]/*اسم*. ڕۆچنە؛ ڕۆژنە؛ نوورگیر؛ دەلاقە یان کونێـک لـە دیوار یان میچەوە بۆ هاتنە ژووری تیشک.

**نـــورگیر**[2]: *صـفت*. بـەرتاو؛ بەرهـەتاو؛ بـەرڕۆژ؛ بەرتیشک؛ لە بەر تیشـکی ڕووناهیـدا ‹ایـن اتـاق نورگیر نیست: ئەم دیوە بەرتاو نیە›.

**نوروز** / nevroz/: [فرانسوی] ☜ **روان‌نژندی**

**نوروز** / nowrûz/:/*اسم*. نەورۆز؛ نەڤـرۆز؛ نـیرۆژ؛ سەرساڵ؛ گەورەترین جێژنی نەتەوەگەلی ئێران، لە سەرەتای ساڵی نوێی هەتاویدا.

**نـــوروگلی** / noroglî/: [فرانســـوی]/*اســـم*. *[زیست‌شناسی]* نۆرۆگلی؛ شانەی پارێزەری مێشک و موخ.

**نـــــورولژی** / norolojî/: ☜ [فرانســـــوی] **عصب‌شناسی**

**نـــورون** / noron ، ـهـا/: [فرانســوی]/*اســم*. *[زیست‌شناسی]* نورۆن؛ یەکەی پێکهاتـەی شـانەی دەماری: **نُرون**

**نوره** / nûre/: [عربی]/*اسم*. واجبی؛ نەورە؛ نـوورە؛ دەرمانێک بۆ لابردنی مووی لەش.

**نورهراســـی** / nûrharāsî/: [عربـی/ فارسـی]/*اسم*. *[روان‌شناسی]* دۆخی نەبوونی وزەی خۆڕاگری لـە بەرامبەر تیشکەوە، بەتایبەت گەزن لێ‌کەوتن لە بەر تیشکی بەقەوەتەوە: **نورترسی**

**نوری** / nûrî/: [عربـی] *صفت*. نـووری؛ تیشـکی؛ بەندیوار بە نوورەوە ‹سال نوری: ساڵی نووری›.

**نوزا** / nowzā/:/*اسم*. نێئوژێن؛ نـاوی دوو خـولی دوایی، لە دەورانی سێهەمی زەوین‌ناسی: **نِئوژن**

**نوزاد** / nowzād ، ـهـا؛ ـان/:/*اسم*. ساوا؛ کۆرپـە؛ ساڤا؛ نووزا؛ نووزاک؛ نـویزادە؛ لـەیر: ١. تـازەزاو؛ گیانـدارێ کـە تـازە هاتبێتـە دونیـاوە ٢. بەبـە؛ چلەدار؛ بـەبک؛ بەبلـە؛ وەوە؛ شـپل؛ وەرمـەکی؛ منداڵی مرۆڤ تا چەن حەفتـە پـاش لـە دایـک

بوون.

**نوزایی** / nowzāyî/: *اسم.* بووژانەوە؛ ژیانەوە: ١. ڕەوتی کەوتنە سەر بڕەو و چالاکی پاش ماوەیەک مەندی و قەیران ٢. ڕونیسانس؛ سەردەمی بە خۆدا هاتنەوەی ئورووپا کە لە سەدەی پانزدەهەم لە ئیتالیاوە دەستی پێ‌کرد و تا سەدەی حەڤدەهەم هەموو ئورووپای داگرت، لەم سەردەمەدا وێژە، هونەر، زانست و پیشە بووژایەوە.

**نوزده**[1] / nûzdah/: *اسم.* نۆزدە؛ ژمارەی سەرەکی پاش هەژدە و پێش بیست.

**نوزده**[2]: *صفت.* نۆزدە: ١. دانەیێ زیاتر لە هەژدە دانە ٢. نۆزدەهەم.

**نوزدهم** / nûzdahom/: *صفت.* نۆزدەهەم؛ نۆزدەهەم؛ لە جێگا و پلەی نۆزدەدا.

**نوزدهمی** / nûzdahomî/: *ضمیر.* نۆزدەهەمین؛ ئەوەی لە جێگا و پلەی نۆزدەهەمدایە.

**نوزدهمین** / nûzdahomîn/: *صفت.* نۆزدەمین؛ نۆزدەهەمین.

**نوزیوی** / nowzîvî/: *اسم.* نۆژینی: ١. دوامین و نۆترین قۆناخی مێژووی زەوی کە بە دوو دەورانی سێهەم و چوارەم دابەش دەبێ ٢. دەورانی سێهەمی زەویناسی کە مرۆی تێدا بەدیهاتووە ❋ **سِنوزوئیک؛ نئوزوئیک**

**نوساز** / nowsāz ، ـها/: *صفت.* نۆساز؛ نویێ‌ساز؛ تازەساز؛ بە بیچم یان بینای تازەوە ‹خانەی نوساز: خانووی نوساز›.

**نوسازی** / nowsāzî ، ـها/: *اسم.* کەلتە: ١. کار و ڕەوتی دروست کردنەوە؛ چاک‌کردنەوەی خراپی، پرتووکاوی و کۆنەیی ٢. گوندەڵبەست؛ کار و ڕەوتی ئاوەدان‌کردنەوە؛ ئاوان‌کردنەوە؛ نوێ‌کردنەوە؛ چا کردنەوەی ڕووخاو.

**نوسان** / navasān ، ـها؛ ـات/: [عربی]*اسم.* لۆژە؛ سەنگەلا؛ شندل؛ لەرە؛ هات‌وچۆ؛ هات‌وچوو؛ لەپ‌لەپ: ١. هەڕاز؛ کاروانە؛ هەلۆر؛ هات‌وچۆی لەپەستا بۆ چەپ و ڕاست یان بان و خوار (وەک بزاوتنی بێشکە) ٢. بان و خوار؛ ڕەوتی گۆڕانی لە پەستای چەنیەتیەک ‹نوسان قیمت: بان و خواری نرخ›.

**نوسانساز** / navasānsāz/: [عربی/ فارسی] ☜ **نوسانگر**

**نوسانگر** / navasāngar ، ـها/: [عربی/ فارسی]*اسم.* ڕاژێنەر؛ هەژێنەر؛ کەرستەیەک بۆ لەرە پێ خستن، بەتایبەت فریکانسی ڕادیۆیی: **نوسانساز**

**نوسانی** / navasānî/: [عربی] *صفت.* ڕاژێنی؛ سەر بە ڕاژان و جوولەی هات‌وچۆیی.

**نوستیزی**/ nowsetîzî ، ـها/: *صفت.* کۆنەپەرستی؛ دژایەتی و بەرەنگاری لەگەڵ داهێنان، گۆڕانگاری و کەڵک وەرگرتن لە دیاردە و بەرهەم و شێوازی نوێ.

**نوسنگی** / nowsangî/: *اسم.* نۆبەردینە؛ دەورانی پێش لە مێژوو کە مرۆڤی سەرەتایی، ئامێر و کەرستەی لە بەرد چێ‌کردووە: **نئولیتیک**

**نوسواد** / nowsavād ، ـان/: [فارسی/ عربی]*اسم.* نۆمس؛ کەسێ کە تازە فێری نووسین و خوێندن بووە.

**نوش**[1] / nûš/: *اسم.* ١. ئاوبارە؛ ئاوارە؛ نۆش؛ هەلالەی هەنگ؛ تراوێکی شیرین لە گوڵدا کە هەنگ دەیکاتە هەنگوین.

**نوش**[2]: *صفت.* گوارا؛ نۆش.

**نوش ـ**[3]: *پیشوازه.* شیرین‌ـ ؛ دڵخواز ‹نوش‌خواب: شیرین‌خەو›.

**ـ نوش**[4]: *پیوازه.* ـ نۆش؛ ئەوەی دەخواتەوە ‹بادەنوش: مەی‌نوش›.

**نوشابه** / nûšābe ، ـها/: *اسم.* نووشابە: ١. خواردنەوەی بێجگە ئاو ٢. کۆلا؛ خواردنەوەی بێ‌ئەلکولی گازدار.

▣ **نوشابەی الکلی**: نووشابەی ئەلکولی؛ نووشابەی ئەلکولدار؛ خواردنەوەیێ کە ئەلکولی تێدایە یان لە ئەلکول بەرهەم

هاتووە. هەروەها: **نوشابەی غیرالکلی**

**نوشادر** / nošādor/ ☜ **نُشادُر**

**نوشاندن** / nûšāndan/: *مصدر. متعدی.* // **نوشاندی**: نۆشاندت؛ **می‌نوشانی**: دەنۆشێنی؛ **بنوشان**: بنۆشێنە// نۆشاندن؛ نۆشنای؛ وەردایش؛ خوەرانن؛ تراو دەرخوارد دان؛ تراو کردنە دەمەوە: **نوشانیدن**. هەروەها: **نوشاندنی**

■ صفت فاعلی: **نوشاننده** (نۆشێنەر)/ صفت مفعولی: **نوشانده** (نۆشێنراو)/ مصدر منفی: **نَنوشاندن** (نەنۆشاندن)

**نوشانیدن** / nûšānîdan/ ☜ **نوشاندن**

**نوشتار** / neveštār ، ـها/: *اسم.* نووسراو؛ نووسراوە؛ نووساو؛ نڤیسراو؛ ئەوەی نووسراوەتەوە، بەتایبەت بۆ وتار.

**نوشتاری** / neveštārî/: *صفت.* نووسینی؛ نڤیسینی؛ پێوەندیدار بە نووسین ‹فرهنگ نوشتاری: فەرهەنگی نووسینی›.

**نوشت‌افزار** / neveštafzār, -'afzār/: *اسم.* ئامرازی نوسین (وەک قەڵەم، کاغەز و…).

**نوشتجات** / neveštecāt/: (!) [فارسی/ از عربی] جمعِ ☜ **نوشته**

**نوشتن** / neveštan/: *مصدر. متعدی.* // **نوشتی**: نووسیت؛ **می نویسی**: دەنووسی؛ **بِنویس**: بنووسە // نووسین؛ نڤیسین؛ نڤیستن؛ نڤیساندن؛ نووسان؛ نووسانن؛ نوشتش؛ نووساندن؛ نویستەی؛ نویسەی؛ نیستەی؛ نوستەنە؛ نووسیەی: ١. کێشانی پیتی ئەلفوبێتکە، ژمارە و نیشانەکانی نووسین لە سەر رووبەرێ ‹نامه نوشتن: نامه نووسین› ٢. دەربڕینی هەواڵ یان مەبەستێک بەم شێوە ‹خبر نوشتن: هەواڵ نووسین› ٣. دانان؛ نووسینی پەرتووک و کتێب ‹نوشتن کتاب: نووسینی کتێب› ٤. تۆمارکردن ‹اسم کسی را نوشتن: ناوی کەسێک نووسین›. هەروەها: **نوشتنی**

■ صفت فاعلی: **نویسنده** (نووسەر)/ صفت مفعولی: **نوشته** (نووسراو)/ مصدر منفی: **ننوشتن** (نەنووسین)

**نوشتنی** / neveštanî/: *صفت.* نووسینی؛ نووسین؛ بۆ نووسین: ١. نووسیانی؛ پێویست بە نووسین ‹مقداری کار نوشتنی دارم: هەندێ کاری نووسینم هەیە› ٢. شیاو بۆ لە سەر نووسین ‹ کاغذ نوشتنی لازم دارم: کاغەزی بۆ نووسینم پێویستە›.

**نوشته** / nevešte ، ـها؛ نوشتجات/: *اسم.* نووسراوە؛ نووسراو؛ ئەوەی نووسراوەتەوە (وەک کتێب، وتار و…).

**نوش‌جان** / nûšecān/: *دعا.* نۆشی گیان؛ نۆش گیان؛ نووشوو گیانی؛ نزای بە خێرێ کە لە پاش خواردن یان خواردنەوەی شتێک دەگوترێ.

⊡ نوش‌جان کردن: کردنە نۆشی گیان؛ نۆش کردن؛ خورادن.

**نوشخند** / nûšxand/: *اسم. [ادبی]* بزە؛ پێکەنینی بە بۆنەی شادیەوە.

**نوشدارو** / nûšdārû ، ـها/: *اسم.* ژاربەر؛ ژاربڕ؛ دژەژار؛ نۆشداروو؛ دەرمانی ژار.

⊡ نوشدارو پس از مرگ سهراب: *[کنایی]* کەپەنەکی دوای باران؛ دوای ترێ خەمشەبڕێ؛ چارە، دەرمان یان یارمەتیەک کە درەنگ بگا و کەڵکی نەبێ.

**نوشکفته** / nowšekofte ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* تازەکراوە؛ تازەپشکۆتوو؛ نۆپشکووت؛ نۆگوڵ؛ خێوی تازەیی و جوانی ‹گل نوشکفته: گوڵی تازەکراوە›.

**ـ نوشی** / nûšî/: *پیواژه.* ـنۆشی؛ ـخۆری؛ ـوەری؛ خواردنەوە ‹بادەنوشی: بادەنۆشی›.

**نوشیدن** / nûšîdan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **نوشیدی**: نۆشیت؛ **می نوشی**: دەنۆشی؛ **بِنوش**: بنۆشە// نۆشین؛ نۆشان؛ خواردنەوە؛ وەخواردن؛ نۆشای؛ نۆش‌کردن؛ فڕکردن؛ فڕکرن؛ وەردش؛ ڤەخوارن. هەروەها: **نوشیدنی**

■ صفت فاعلی: **نوشنده** (نۆشەر)/ صفت مفعولی: **نوشیده** (نۆشراو)/ مصدر منفی: **نَنوشیدن** (نەنۆشین)

**نوشـیدنی** / nûšîdanî ، ـها/:اسم. خواردنـەوە؛ خواردنـەوەیی؛ نووشـابە ‹نوشـیدنی چـە داریـد؟: خواردنەوە چتان هەیە؟›.

**نوشین** / nûšîn/: صفت.[ادبی] شـیرین؛ شـیرن؛ خۆش و لەبەردڵان ‹خواب نوشین: خەوی شیرین›.

**نوظهور** / nowzohûr, -zuhûr/: [فارسـی/ عربـی] صفت. تازەداهاتوو؛ نووژەن؛ نیڤار؛ نۆژەن ‹پدیدەی نوظهور: دیاردەی تازەداهاتوو›.

**نوع** / now', no:'/ ، ـها؛ انواع/: [عربـی]/اسم. جـۆر؛ چەشن؛ پێڵ؛ تەرز؛ گۆنـە: ١. تـەخلیت؛ کسـم؛ لەون؛ تاقمێک کە دانستەی هاوبەشـیان هـەبێ ‹این نوع آدمها را باید خوب شناخت: ئەم جورە مرۆڤانە دەبێ چاک بناسی› ٢. چۆنیەتی؛ مارک ‹لطفا نوع خوبش را بدهید: تکایە لـە جـورە باشـەکەی بـدەن› ٣.[زیست‌شناسـی] تـاقم؛ پچـووکترین بـەش لـە ڕیزبەندی گیاندار و ڕوەکدا ٤. ڕەگەز ‹هـم نـوع: هاو ڕەگەز›.

**نوعـا** / now'an, no:'an/: [عربـی] قیـد. لـە بـاری جۆر، تەرز یان چەشنەوە.

**نــوع‌پــروری** / now'parvarî, no:'-/: [عربـی/ فارسی]/اسم. مرۆدۆسـتی؛ بەشـەردۆسـی؛ کـار و ڕەوتی خۆش ویستن و یارمـەتی دانی مـرۆ بـە گشتی. هەروەها: **نوع‌پرور**

**نــوع‌دوســتانه** / now'dûstāne, no:'-/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. مــرۆدۆســتانە؛ بەشەردۆسـانە؛ هاوماڵدۆستانە.

**نوع‌دوستی** / now'dûstî, no:'-/: [عربی/ فارسـی] اسم. مــرۆدۆســتی؛ بەشەردۆســی. هــەروەها: **نوع‌دوست**

**نوعروس** / now'arûs ، ـها؛ ـان/: [فارسـی/ عربـی] اسم. تازەبووک؛ نۆبووک؛ تـازەووەوی؛ تـازەوەیوە: ١. بوویکانوو؛ گەورەکچێ کـە تـازە بۆتـە بـووک ٢.[مجازی] زەری؛ ژنی تازەلاو ٣.[مجازی] شتی زۆر جوان و لەبەردڵان.

**نوعی** / now'î/: [عربی] صفت. چەشـنی؛ جـۆری؛ تاقمی؛ بەندیوار بە چەشنەوە ‹ویژگی‌هـای نـوعی: تایبەتمەندیگەلی جەسی›.

**نوغـان** / nowqān, no:qān/:اسم. ١. کەکڵـێ؛ هالیە؛ هارییە؛ کرمی ئاوریشمی؛ کرم هەورێشـم ٢. کەلوو؛ تەتلە؛ تەتلەمیوە؛ پیلە؛ ماڵـی کرمـی هەورێشم.

**نوغاندار** / nowqāndār, no:qān- ، ـها؛ ـان/:اسم. ئـەوی کرمـی ئاوریشـم بـار دێنـێ. هــەروەها: **نوغانداری**

**نوک** / nuk, nok ، ـها/:اسم. دەنووکە؛ دندۆکـە؛ نـووک؛ نـۆک؛ نـک: ١. تـک؛ تـووک؛ نوچـک؛ سـەری باریکـەوەبوو یـان باریـکـکراوی هـەر شتێک ‹نوک مداد: سووکی قەلـەم› ٢. دەنـووک؛ دندۆک؛ داندوک؛ دوندوک؛ دەندوک؛ دنـدوول؛ نەقور؛ نیکـل؛ نووکـل؛ شـەند؛ نـووکی پەلـەوەر ٣.[مجازی] کەپۆی ماسی.

▣ نوک پا راه رفتن: بە سەرپەنجە ڕۆیشتن ‹چرا این بچه هنوز نوک‌پا راه می‌رود؟: ئەم منداڵە بـۆچی هێشتا بە سەر بەنجە دەڕوا؟›.

نوک زبان بودن: لە سەر زمان بوون؛ لە سـەر زارەوە بوون؛ لە ئاسانەی بیر هاتنـەوەدا بـوون ‹آقا! نوک زبانم بود و داشتم می‌گفتم: کاکە! لە سەر زمانم بوو، خەریک بوو دەمگوت›.

نوک زبـانی حـرف زدن: پسـک قسـەکردن؛ پسکەپسک قسەکردن؛ زمان پاک نەکردنەوە؛ جوان قسە نەکردن (وەک منداڵێ کە تازە زمان دەگرێ).

نوک زدن: دەندووک/ دەنووک لێـدان؛ نـۆک لێدان؛ دەنـووک داونـەی؛ بـە دەنـدووک لـە شتێک دان بۆ خواردن یان خواردنەوە.

نوک کسی را چیدن/ قیچی کـردن:[مجـازی] زاری کەسێک بەستن؛ کەسـێک بـێ دەنـگ کردن؛ نقی کەسێک چنین؛ نقـە لـە کەسـێ برین؛ فزەی کەسێک برین.

**نوک‌تیز** / nuktîz, nok- ، ـها/: صفت. نووک‌تیـژ؛

سەرتیژ؛ بە سەری باریک و تیژەوە.

**نوکر** / nowkar, no:kar ، ـها؛ ـان/: [مغولی]/اسم. نۆکەر؛ نووکەر؛ پاکورە؛ ئیرمان: ۱. دەرمالە؛ دەرمالی؛ ئایم؛ خولام؛ خولام؛ غولام؛ پێکورە؛ مەستەر؛ خزمەتکار؛ خزمەتچی؛ پیاوێ کە خزمەتکاری مالێکە یان کاری کەسێک جێبەجێ دەکا ۲. مزبگیر؛ بەکرێگیراو.

▣ نوکر بی جیره و مواجب: نۆکەری بێمز/ خۆرایی.

نوکر دولت: کارمەندی دەولەت.

**نوکرباب** / nowkarbāb, no:kar-/: [مغولی/ عربی] صفت. نۆکەرانە؛ وەک یان شیاوی نۆکەر ‹سر و وضع نوکرباب: سەر و سەکەتی نۆکەرانە›.

**نوکری** / nowkarî, no:karî/: [مغولی]/اسم. نۆکەری؛ نۆکەراتی؛ نۆکەرایەتی: ۱. گورەیش؛ گۆرەیش؛ کاری نۆکەر ‹دو سال در خانەی یک حاجی نوکری کردم: دوو ساڵ لە مالی حاجیەک نوکەریم کرد› ۲. دۆخ یان چۆنیەتی نۆکەر بوون ‹کارم شده بود نوکری این و آن: کارم ببووە نوکەری ئەموئەو›.

**نوکلاسیک** / nowkelāsîk/: [فارسی/ فرانسوی] /اسم. نۆکلاسیک؛ ڕاپەڕینی هونەری و وێژەیی بۆ بووژاندنەوەی هۆرتە و بەرەی کلاسیک: **نئوکلاسیک**

**نوک‌مدادی**[1] / nukmedādî, nok-/: [فارسی/ عربی]/اسم. دووکەلی؛ ڕەنگی کەوەی خەست و بریقەدار کە بۆ خۆلەمێشی دادەکشێ.

**نوک مدادی**[2]: صفت. دووکەلی؛ بە ڕەنگی کەوەی خەست و بریقەداری مەیلەو خۆلەمێشی.

**نوکیسه** / nowkîse/: [فارسی/ از عربی] صفت. نۆکیسە؛ تازەکیسە؛ نۆبەخت؛ دیتۆک؛ تازەپێداکەوتوو؛ دەولەمەن‌چلکن؛ لە کوت‌وپڕا دەولەمەند بووی لێنەزان.

**نوگرایی** / nowgerāyî/: اسم. نۆخوازی؛ نوێوازی: ۱. لایەنگری لە شێوە و ڕێبازی تازەی هونەری و وێژەیی ۲. لایەنگری لە شێوازی فەرهەنگی و کۆمەلایەتی نوێ. هەروەها: **نوگرا**

**نول** / novel ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. نوڤیل؛ چیرۆک؛ ڕۆمان؛ بەسەرهات یان داستانی داندراو لە ئەزموونی مرۆڤ بە شێوەی پەخشانێکی دوور و درێژ کە لە سەر ڕووداوێکی سەرەکی هۆنرابێتەوە: **نووڵ**

**نول** / nul/: [فرانسوی] صفت. ۱. پووچەل؛ بەتاڵ؛ هلۆل ۲. هاوسەنگی سیفر.

**نولیست** / novelîst ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. چیرۆکنوس؛ نوڤیلنووس؛ ڕۆماننووس.

**نومسلمان** / nowmosalmān ، ـها/: [فارسی/ عربی] صفت. [ادبی] نۆموسولمان؛ تازەبسلمان.

**نومید** / nowmîd, no:mîd/: صفت. ناهمێ؛ نائۆمید؛ لێڤەر؛ خۆبان؛ هیوابراو؛ دلسارد؛ دلسەرد؛ بێهێڤی.

▣ نومید شدن: ناهومێد/ ناهمێ بوون؛ لووت شکان؛ هیوا/ هومێد بڕان؛ دلسارد بوونەوە؛ تەواسان؛ تەواسیان؛ تەواسیانەوە؛ تەواسیای.

نومید کردن: ناهومێد/ ناهمێ کردن؛ لووت شکاندن؛ دلساردکردنەوە؛ بێهیوا کردن؛ تەوسانن؛ تەوساندن.

**نومیدانه**[1] / nowmîdāne, no:mîdāne/: صفت. ناهمێدانە؛ ناهومێدانە؛ نائومیدانە؛ هیوابڕاوانە ‹تلاش نومیدانه: کردوکاشی ناهمیدانە›.

**نومیدانه**[2]: قید. بە ناهمێدیەوە؛ بە تەوەساویەوە؛ ناهومێدانە ‹برای نجات او نومیدانه تلاش می‌کرد: بۆ ڕزگار کردنی بە ناهمیدیەوە هەولی دەدا›.

**نومیدی** / nowmîdî, no:mîdî ، ـها/: اسم. نائومێدی؛ ناهومێدی؛ ناهمێدی؛ دلساردی؛ دلسەردی؛ تەوساوی.

**نون** / nûn/: [عربی] اسم. نێ؛ ناوی عەرەبی بیست و نۆهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**نونوار** / nownavār/: [فارسی/ ؟] صفت. نک‌نوار؛

نۆنەوار: ١. تەرپۆش؛ بە جلوبەرگی تازە و ڕازاوەوە ‹آرام را دیدم حسابی نونوار شده بود: ئارامم بینی تەواو تەرپوش ببوو› ٢. نفتونۆڵ؛ تازە و نوێ؛ نفتونوێ (بۆ جلوبەرگ و کەوش) ‹کفش‌ها را شستم و واکس زدم، نونوار شد: کەوشەکانم شت و بۆیەم کردن، نفتونول بوونەوە›.

**نونهال** / nownahāl ، ـان/: *اسم. [مجازی]* نۆنەمام؛ نەونەمام؛ منداڵ، بەتایبەت منداڵی شەش تا دوازدە ساڵان.

**نوول** / novel/: [فرانسوی] ☜ **نوِل**

**نــوه** / nave ، ـها/: *اسم.* منداڵەزا؛ نەڤی؛ نەوە؛ نەوکی؛ منداڵی‌منداڵ؛ بەچەزا؛ کوڕەزا و کچەزا؛ پشتی دووهەم.

**نوهراسی** / nowharāsî/: *اسم.* نۆترسی؛ ترس لە شتی تازە.

**نوید** / navîd ، ـها/: *اسم. [ادبی]* مزگێنی؛ مزگانی؛ مزگینی؛ نزانی؛ مژدە؛ موژدە ‹سوسوی چند چراغ از دور، نوید پیدا شدن یک آبادی را می‌داد: ترووکەترووکی لە دوورەوەی چەن چرا، مزگینی دەرکەوتنی ئاوایییەکی دەدا›.

**نویدبخش** / navîdbaxš/: *صفت.* دڵخۆشکەر؛ مزگێنی‌دەر؛ مزگانی‌دەر؛ مژدەدەر ‹اظهارات پزشکان بسیار نویدبخش بود: قسەی دوکتورەکان زۆر دلخوشکەر بوو›.

**ـنویس** / nevîs/: *پیواژە.* ـنووس؛ ـنڤیس؛ ـنویس؛ نووسەر ‹نمایشنامەنویس: شانۆنامەنووس›.

**نویســاندن** / nevîsāndan/: *مصدر. متعدی.* // **نویساندی:** پێت‌نووسی؛ **می‌نویسانی:** پێ‌دەنووسی؛ **بنویسان:** پێ‌بنووسە// پێ‌نووسین؛ نویسەی پنەی؛ پەنە نویسەی: **نویسانیدن.** هەورەها: **نویساندنی**

■ صفت فاعلی: **نویساننده** (پێ‌نووسەر)/ صفت مفعولی: **نویسانده** (پێ‌نووسراو)

**نویسانیدن** / nevîsānîdan/ ☜ **نویساندن**

**نویسندگی** / nevîsandegî/: *اسم.* نووسەری؛ نویسنەیی؛ نڤیساری: ١. کاری نووسین ‹از نویسندگی نان می‌خورد: لە ڕێی نووسینەوە بەڕێ دەچێ› ٢. کار و ڕەوتی کێشانی پیتگەلی ناسراو ٣. هونەری نوسین ‹نویسندگی را در مدرسه یاد نمی‌دهند، آدم خودش باید یاد بگیرد: نووسەری لە قوتابخانەدا فێر ناکرێ، دەبێ بۆخۆت فێر بی›.

**نویسنده** / nevîsande ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* نووسەر؛ نڤیسەر؛ نڤیسکار؛ نڤیسار؛ نڤیسەڤان؛ نوشتۆخ؛ نووسندە: ١. بنووس؛ ئەوەی شتێکی نووسیوە ‹نویسندەی مقالە: نووسەری وتار› ٢. ئەوەی بەرهەمێک (وەکوو کتێب، وتار، شانۆنامە و...) دەنووسێ.

**نویسه**[1] / nevîse ، ـها/: *اسم.* ١. پیت؛ هەر کام لە نیشانەکانی خەتێک (وەک «ا» و «ب» و ... یان «a» و «b» و ... ) ٢. سەرجەمی چەند پیت کە برگەیەک پێک دێنن (وەک «شەو» یان «گار» لە «شەوگار»دا).

**نویسه**[2]: *صفت.* نووسراوە؛ نووسیاگ ‹شکل نویسەی واژە: شێوەی نووسراوەی وشە›.

**ـ نویسی** / nevîsî/: *پیواژە.* ـ نووسی؛ ـ نڤیسی؛ ـ نویسی؛ نووسین ‹داستان‌نویسی: چیرۆک‌نووسی›.

**نوین** / novîn, navîn/: *صفت.* تازە؛ نوێ؛ وێ؛ نوهین؛ نفتونەو.

**نه**[1] / na/: *اسم.* نە؛ نا؛ نۆ؛ نەو؛ نەی؛ نێ؛ نیشانەی وەرامی پێچەوانە ‹او به کسی نه نمی‌گفت: نەی بە کەس نەدەگوت›.

**نه**[2]: *قید.* نە؛ نا: ١. نیشانەی دژایەتی دەگەڵ قسە و پێشنیاری کەسێک ‹نه، این لباس خوب نیست: نە، ئەم جلە باش نیە› ٢. نیشانەی وەڵامی پێچەوانەی پرسیاری کەسێک ‹سارا آمد؟ نە، نیامد: سارا هات؟ نە، نەهات› ٣. نیشانەی پێداگری ‹نه، دیگر از این کارها نمی‌کنم: نە، ئیدی کاری وا ناکەم› ٤. نەکوو؛ نەوەکوو؛ نەوەک؛ نەکا؛ نەکوا؛ نەوا ‹نه خیال کنی با این کار مخالفم: نە پێت وابێ دژ بەم کارەم›.

**واژگـــون** / vājgûn/: صـفت. وەرگـەڕاو؛ دەمەوخوار؛ دەمەونخون؛ دەمەوژێر؛ دەمـەوڕوو؛ سەرەوژێر: ۱. ئـاواژی؛ بـەراوەژوو؛ قلـپ؛ واژی؛ بــەرەواژی؛ بەرۆڤـازی؛ بەلەڤـازی؛ ئـاوەژوو ۲. هەڵدێراو؛ ژێر و ژوور؛ ژێر و بـان؛ ژێـر و ڕوو؛ هەڵــگەڕاوە؛ دەرنخــون؛ ســەرەونخون؛ دەرنـەخوون؛ قلـپ؛ بەروپشـت؛ بەراوپشـت؛ سـەرنخون؛ پـەرت؛ سـەرەونوون؛ سـەرنوخین؛ ژێربان ❋ **بازگون**

**واژگونگی** / vājgûnegî/: اسم. سـەرەونخوونی؛ وەرگـەڕاوەیی؛ دەمــەوخواری؛ دەمــەوژێری؛ ئـاوەژوویی؛ بـەراوەژوویی؛ دۆخ یـان چۆنیـەتی سەرەونخوون بوون.

**واژگونـه**[1] / vājgûne/: صـفت. سـەرەونخوون؛ دەمەوخوار؛ ئـاوازی؛ دەمـەوژێر؛ ئـاوەژوو؛ واژی؛ هەڵدێراو؛ بەراوەژوو.

**واژگونه**[2]: قید. بە سەرەونخوونیەوە؛ دەمەوخوار؛ دەمەوڕوو؛ ئاوەژوو.

**واژگونی** / vājgûnî/: اسم. وەرگەڕاوی؛ ڤاجایی؛ بەراوەژوویی؛ سەرەونخوونی؛ دەمەوخواری؛ دۆخ یان چۆنیەتی سەرەوژێر بوون.

**واژن** / vājan ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. زێ؛ دۆڵان؛ لوولەی ماسوولکەیی لە نێوان پـزدان و شـەرمی ژناندا.

**واژه** / vāje ، ـها؛ ـگان/: اسم. وشـە؛ وتـە؛ گوتـە؛ کوتە؛ بێژە؛ وێژە؛ واژە؛ لەبز؛ کەلیمە؛ سەرجەمی چەند پیت کە یەکـەیێکی سـەربەخۆی مانـادار پێک‌دێنێ (وەک نان، باش، هاتم، ئاخ، کردار و...).

**واژه‌سازی** / vājesāzî/: اسم. وشەسـازی؛ کـار و ڕەوتی داڕشتنی وشە.

**واژه‌گزینـی** / vājegozînî/: اسـم. وشــەبژێری؛ کاری هەڵبژاردنی وشەی لەبار یان پێویست.

**واژه‌نامـه** / vājenāme ، ـهـا/: اسم. وشــەدان: ۱. کتێبێکی سەربەخۆی جووت‌زمان، بریتی لـە وشــەی تایبـەتی لقێکـی زانسـتی زمانێـک بـە زمـانێکی‌تـر ۲. پێرسـتی وشـە دژوارەکـانی کتێبێک لە پاشکۆی کتێبەکەوە ۳. فەرهەنگ.

**واژه‌نما** / vājenemā ، ـهـا/: اسم. وشـەیەک لـە سەرەوەی لاپەڕەی وشەدان یا کتێبی چاوگـەوە کە نیشانەی یەکەمین یان ئـاخرین لێمایـە لـەو لاپەڕەدا.

**واژه‌یابی** / vājeyābî/: اسم. وشـەدۆزی؛ کـار و ڕەوتی دۆزینەوەی وشەگەلی لەبار و پێویست.

**واسـال** / vāsāl ، ـها؛ ـان/: اسم. [قـدیمی] زاوت؛ نوێنەری خاوەن زەوی و زار بۆ پێراگەیشتن بـە کــاری کشــت‌وکــاڵ و کۆکردنــەوەی پیتــاکی سەپێنراو بە سەر جووتیاراندا.

**واسـرنگ** / vāsarang, vāserang ، ـهـا/: اسم. [گفتـاری] هێـرش؛ شـاڵاو؛ پـەلامار؛ هــورووژم؛ هەڵمەت؛ هەشاوڵ؛ هاشاوڵ؛ هاشاڵ.

▣ **توی دل کسی واسرنگ رفتن**: هاشاوڵ بـردن بۆ کەسێ؛ ئامبازی کەسێ بوون؛ پەلامار دانـە سەر کەسێک.

**واسـرنگیدن** / vāsarangîdan, vāserangîdan/: مصدر. متعدی. [گفتاری] // **واسرنگیدی**: پـەلامارت دا؛ **وامی‌سرنگی**: پەلامار دەدەی؛ **واسرنگ**: پەلامار دە// ۱. پەلامار دان/ بردن؛ ڕاهێشتن؛ پەلـەمار دەی/ دای؛ هەڵمەت بۆ بردن؛ هاشاوڵ/ شـاڵاو بـردن؛ هــرووژم بــردن؛ هێــرش کردنــە ســەر ۲. ڕوو وەرگەڕاندن؛ لا لێ نەکردنەوە.

■ صفت مفعولی: **واسرنگیده** (پەلاماردراو)

**واسطه** / vās(e)te ، ـها/: [عربـی]/اسم. ۱. /وسایط [نامتداول]/ ناوجی؛ نێونجی؛ نێوان‌گیر؛ نـاوبژیوان؛ ناڤبژیوان؛ سنگە؛ ئەوی بۆ بەرگری لە شەڕ یـان ئاشت‌کردنەوە دێتە پێشەوە ۲. شـناس؛ ئاشـنا و ڕۆشنا؛ پارتی؛ ئەو کەسـە دەسـتی دەڕوا و کـار جۆر دەکا ‹برای این کار دست به دامن چند تا واسطه شدم: بۆ ئـەم کـارە پـەنام بـەر چـەن شـناس بـرد› ۳. دەلال؛ ڕێخەری مامەڵەی کڕیار و فرۆشیار.

**واسطه‌گری** / vās(e)tegarî/: [عربی/ فارسی]/اسم.

دەلالی؛ پیشە و کاری دەلاڵ.

**واسکازین** / vāskāzîn/: [انگلیسی]/*اسم*. واسکازین؛ ڕۆنێکی خەستە لە وەچەی نەوت، تایبەتی گیربوکس و دیفرانسیلی ماشین کە لە بەرانبەر گەرما و تەوژمەوە زۆر هەڵدەکا.

**واسە** / vāse/: *حرف. [گفتاری]* بۆ؛ ژبۆ؛ لەبۆ؛ ئەڕا؛ پەی؛ پەرێ ‹واسەی چی؟: واسە شما بود: بۆ چی؟ بۆ ئێوە بوو›.

**واشر** / vāšer ، ـها/: [انگلیسی]/*اسم*. بەرپێچ؛ واشیر؛ ئاڵقەیەکی تەخت و تەنکە دەخرێتە نێوان پێچ و مۆرەوە بۆ کپ بوون، ئاو نەدان یان نەکرانەوە.

**واشە** / vāše/: [کردی]/*اسم*. واشە؛ باشوو؛ باشووک؛ باڵەوان؛ تورمتە؛ مەلێکی پچووکی ڕاوکەرە زۆرتر چۆلەکە دەگرێ.

**واصل** / vāsel/: [عربی] *صفت*. گەیشتوو؛ دەسکەوتوو؛ گەییوو؛ گەییگ.

▣ **واصل شدن**: گەیشتن؛ گەیین؛ بە شوێن یان بە دەستی کەسێک گەیشتن.

**واضح**[1] / vāzeh/: [عربی] *صفت*. ڕوون؛ ئاشکرا؛ خویا؛ پەیا؛ پەیدا؛ دیار؛ شیاوی لێ تێگەیشتن ‹تصویر واضح: وێنەی ڕوون›.

**واضح**[2]: *قید*. بە ئاشکرا؛ ئاشکرا؛ ڕوون؛ ڕاشکاو؛ بە ڕاشکاوی؛ بە ئاشکرایی؛ بە ڕوونی ‹واضح دیده می‌شد: بە ئاشکرا دەبینرا›.

**واضع** / vāze' ، ـان/: [عربی] *صفت*. ۱. بەدیهێنەر؛ پێکهێنەر ۲. دانەر؛ بەتایبەت دانەری دەستوور و نەریت ‹واضع قانون: دانەری قانوون›.

**واعظ** / vā'ez ، ـها؛ ـان؛ ـین؛ وعّاظ/: [عربی]/*اسم*. ئامۆژیار؛ ئامۆژگاریدەر؛ مۆچیاریکەر.

▣ **واعظ غیر متّعظ**: گوویی کەر؛ ئامۆژیاری بێ کردار؛ کەسێ کە گوێی بۆ قسەی خۆی شل نیە.

**وافر** / vāfer/: [عربی] *صفت*. زۆر؛ فرە؛ فریە؛ فراوان؛ زەبەند؛ زەحف؛ فرەوان ‹پول وافر داشت: پارەی زۆری بوو›.

**وافور** / vāfûr ، ـها/: [لاتینی]/*اسم*. بافوور؛ وافوور؛ ئامرازی تریاک کێشان، بریتی لە لوولەیەکی چێوی کورت کە لکاوەتە پیاڵەیەکی زارتەنگی زۆر چکۆلەوە: **بافور** *[گفتاری]*

**وافوری** / vāfûrî ، ـها/: [لاتینی] *صفت*. بافووری؛ مەفەنگی؛ شیرەیی؛ تریاکی؛ هۆکارەی تریاک کێشان بە بافوور.

**وافی** / vāfî/: [عربی] *صفت. [ادبی]* تەواو؛ تێر و پڕ؛ بەسندە؛ پڕ بە پێست؛ چڕ و پڕ؛ بە ئەندازەی شیاو.

**واق** / vāq/: *صوت. [گفتاری]* وەڕە؛ حەپە؛ گەفە؛ گەف؛ عەف؛ هەف؛ ڤڕ؛ ڤڕاسە؛ دەنگی سەگ.

**واقع**[1] / vāqe'/: [عربی]/*اسم. [گفتاری]* ڕووداو؛ ڕووداوە؛ ئەوەی ڕووی داوە ‹خلاف واقع: بە پێچەوانەی ڕووداو›.

**واقع**[2]: *صفت*. ۱. ڕووداو؛ ڕووداوە؛ کار و ڕەوتی قەومان؛ قەومیان؛ قۆمیەی؛ ڕوودان ‹این حادثه دیروز واقع شد: ئەم کارەساتە دوێنێ ڕووی دا› ۲. هەڵکەوتوو؛ بە دۆخ یان چۆنیەتی بوون لە شوێنێکدا ‹خانه‌ی او در یکی از کوچه‌های اصلی واقع بود: ماڵەکەی لە کۆڵانێکی سەرەکیدا هەڵکەوتووە›.

هەروەها: **واقع شدن**

**واقعا** / vāqe'an/: [عربی] *قید*. لە ڕاستیدا؛ بە ڕاستی؛ بە ڕاسی ‹واقعا درس می‌خواندم؛ واقعا نمی‌خواست برود: بە ڕاستی دەرسم دەخوێند؛ لە ڕاستیدا نەیدەویست بڕوا›.

**واقع‌بینانه**[1] / vāqe'bînāne/: [عربی/ فارسی] *صفت*. ڕاستبینانە؛ ڕاس‌بینانە؛ بەشدار لە ڕاستبینی ‹ارزیابی واقع‌بینانه: هەڵسەنگاندنی ڕاستبینانە›.

**واقع‌بینانه**[2]: *قید*. ڕاستبینانە؛ بە ڕاستبینیەوە؛ هاوڕێ دەگەڵ ڕاستبینیدا ‹واقع‌بینانه قضاوت کرد: ڕاستبینانە داوەری کرد›.

**واقع‌بینی** / vāqe'bînî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم*. ۱. ڕاستبینی؛ ڕاس‌بینی؛ ڕەوتی گرنگی دان و سەرنج دان بە ڕاستی و چاوپۆشی لە خەیاڵی خاو ۲. کار یان توانایی دیتن، فامین و بەراوەرد

کردنی ڕووداو و دیارده بەو شێوە کە هەیە. هەروەها: **واقعبین**

**واقعگرا** / vāqe'gerā ، ـها؛ ـیان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ڕاستیواز؛ هۆگر و شوێنکەوتووی ئەوی ڕاستی ڕووداوە.

**واقعگرایی** / vāqe'gerāyî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ڕاستیوازی؛ ڕیئالیسم: ۱. ئۆگرەتی و سەرنج بەرەو ئەوی ڕێ‌تێ دەچێ ڕوو بدا یان ڕووی داوە و خۆ پاراستن لە خەیاڵی خاو ۲. ئامۆژەیێ کە جەهان بە بوونەوەرێکی ڕاستەکی و لە دەرەوەی ئاوەزی مرۆڤ دەزانێ ۳. بڕوا بەوەی کە هەر چی مرۆڤ لێی تێ‌بگا، بوونی هەیە و ڕاستەکیە ٤. ئەمەگداری بە سروشت و ژیانی ڕاستەکی و پارێز لە خەیالات

＊ **اصالت واقع**

**واقعه** / vāqe'e ، ـها؛ وَقایع/: [عربی] *اسم.* کارەسات؛ ڕووداو؛ پێشهات (زۆرتر ناخۆش و ناڵەبار)؛ ‹واقعەی کوی دانشگاه: ڕووداوی گەڕەکی زانستگا›.

**واقعی** / vāqe'î/: [عربی] *صفت.* ڕاستەکی؛ بە بوونێکی ڕاستەقینەوە ‹آرام یک دوست واقعی بود: ئارام دۆستێکی ڕاستەکی بوو›.

**واقعیات** / vāqe'îyyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **واقعیّت**

**واقعیت** / vāqe'îyyat ، ـها؛ واقعیّات/: [عربی] *اسم.* ڕاستەقینە؛ ڕاستەقانی؛ ڕاستی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی ڕاست بوون ۲. کۆمەڵە شت و ڕووداوی بە ڕاستی ‹تلاش برای فرار از واقعیت بیهوده است: هەوڵ بۆ دەرچوون لە ڕاستەقینە بێخۆیە› ۳. ڕاست؛ چۆنیەتی، چییەتی یان شێوەی ڕاستەکی ‹رویای او به واقعیت پیوست: خەیاڵەکەی بوو بە ڕاست›.

**واقف**[1] / vāqef ، ـان/: [عربی] *اسم.* خەیرومەند؛ کەسێ کە شتێک وەقف دەکا.

**واقف**[2]: *صفت.* ئاگادار؛ ئاگا؛ هاگا؛ باخەبەر ‹او به همەی اسرار زندگی ما واقف بود: ئەو لە ژێر و بنی ژیانی ئێمە ئاگادار بوو›. هەروەها: **واقف بودن؛ واقف شدن؛ واقف کردن؛ واقف گشتن**

**واق‌ـواق** / vāqvāq/: *صوت.* وەڕەوەڕ؛ حەپەحەپ؛ عەوعەو؛ عەوعەعەو؛ هەفەهەف؛ عەوتەعەوت؛ حەوحەو؛ حەپەی لەسەریەکی سەگ.

**واکس** / vāks/: [روسی] *اسم.* واکس؛ بۆیاخ؛ بۆیاغ؛ ڕەنگی کەوشان؛ ڕۆنێکی خەستی بریقەدار (و ڕەنگی) بۆ بریقە پێ‌خستنی: *الف)* ڕووکاری کەوش و کەلوپەلی چەرمی *ب)* تەختپۆش *ج)* ڕووکاری برێ کەرستەی ئاسنی.

◘ **واکس زدن**: واکس کردن؛ بۆیاخ دان؛ پێداساوینی واکس ‹کفش‌هایی که تازه واکس زده بودم، یکپارچه گلی شد: ئەو کەوشانەی تازە واکسم کردبوون، یەکسەر بوونە قوڕ›.

**واکسن** / vāksan ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* واکسین؛ واکسەن؛ هەوێنێ لە میکرۆبی نیوەگیان و کوژراوی پەتایێ کە بۆ بەرگری لە تووشیار بوون، دەیخۆنەوە یان دەیوەشێنن.

**واکسی**[1] / vāksî ، ـها/: [روسی] *اسم.* واکسی؛ بۆیەچی؛ بۆیاغچی؛ کەوش بۆیاخ‌کەر ‹واکسی سر کوچەی ما بود: واکسی سەر کۆڵانی ئێمە بوو›.

**واکسی**[2]: *صفت.* واکساوی؛ تلاو بە واکسەوە ‹جورابم را هم واکسی کرد: گۆرواکانیشمی واکساوی کرد›.

**واکسیل** / vāksîl ، ـها/: [روسی] *اسم.* واکسیل؛ پەلکە قەیتانی سەرشانی چەکداران.

**واکسیناسیون** / vāksînās(i)yon/: [فرانسوی] *اسم.* واکسیناسیۆن؛ کوتان؛ کاری تێرۆکردنی واکسین بۆ ناو لەش.

**واکسینه** / vāksîne/: [فرانسوی] *صفت.* کوتاو؛ دەرزی لێدراو؛ واکسینە؛ دەرزی کوتراو/ وەشراو.

◘ **واکسینه شدن**: واکسینە بوون؛ واکسەن چوونە لەشەوە. هەروەها: **واکسینه کردن**

**واکمن** / vākman ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* واکمەن؛ ناوی بازرگانی بۆ دەزگای چکۆلەی

بلاوکەرەوەی دەنگ.

**واکنش** / vākoneš ، ـها/: *اسم.* ١. زیچ؛ کاردانەوە؛ کار یان ڕەوتێک لە وەڵامی کار یان ڕەوتێکی تردا ٢. بەرهەڵستی؛ بەرەنگاری؛ نەیاری و نارەزایەتی لە ئاست دۆخی ڕووداودا ٣. بەرپەرچ؛ وەڵامی ناویستەکی لەش لە ئاست دنەدەرێکدا ٤. *[شیمی]* گۆڕانکاری کیمیایی.

**واکه** / vāke ، ـها/: *اسم. [زبان‌شناسی]* دەنگدار.

**واکی‌تاکی** / vākîtākî ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* واکی‌تاکی؛ دەزگای بچووک و دەستهەڵگری ناردن و گرتنی دەنگی رادیۆیی.

**واگذار** / vāgozār/: *صفت.* سپاردە؛ ڕەوتی سپاردن.

⊡ **واگذار شدن:** سپێردران؛ پێ‌دران؛ پێ‌بڕان؛ کەوتنە ژێر دەستی کەسێکی‌تر ‹اختیارات رئیس به معاونش واگذار شد: دەسەلاتی سەرۆک بە جێگرەکەی سپێردرا›.

**واگذار کردن:** سپاردن؛ پێ‌سپاردن؛ دان بە کەسێک ‹همه چیز را به همسرش واگذار کرد: هەموو شتێکی بە ژنەکەی سپارد›.

**واگذاردن** / vāgozārdan/ ☜ **واگذاشتن**

**واگذاری**[1] / vāgozārî/: *اسم.* کار یان ڕەوتی شتێ بە کەسێک دان؛ بەخشین؛ دانان ‹با واگذاری املاکش به انجمن‌های خیریه خود را خلاص کرد: بە بەخشینی ماڵ و دارایییەکی بە ئەنجومەنە خێرخوازەکان خۆی لێ ڕزگار کرد›.

**واگذاری**[2]: *صفت.* بەخشراو؛ دراو؛ ڕاگوێزراو؛ درباگ ‹زمین‌های واگذاری: زەوینە بەخشراوەکان›.

**واگذاشتن** / vāgozāštan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **واگذاشتی:** ڕاتگوێزا؛ **وامی گذاری:** ڕادەگوێزی؛ **واگذار:** ڕاگوێزە // ١. ڕاگوێزان؛ ڕاگواستن؛ سپاردن؛ دەسەلات یان مافی شتێک بە کەسێ دان ‹نوبت را به دیگری واگذاشتن؛ ملک را به خریدار واگذاشتن: نۆرە بە دیتری ڕاگوێزان؛ موڵک بە کڕیار سپاردن› ٢. بەخشین؛ دان؛ پێشکەش کردن ‹خانه را به زنش واگذاشت: ماڵەکەی بەخشیە ژنەکەی› ٣. دەس لێ‌بەردان؛ وێڵ کردن * **واگذاردن**. هەروەها: **واگذاشتنی**

■ صفت فاعلی: **واگذارنده** (ڕاگوێزەر)/ صفت مفعولی: **واگذاشته** (ڕاگوێزراو)/ مصدر منفی: **وانَگذاشتن** (ڕانەگوێزان)

**واگرا** / vāgarā/: *صفت.* ١. بڵاوەخواز؛ دوورەوەگر؛ دۆخ یان چۆنیەتی لێک پرش و بڵاو بوونەوە ‹جمعیت واگرا: ئاپۆرەی بڵاوەخواز› ٢. *[فیزیک]* بڵاو؛ تایبەتمەندی تیشکێ کە بڵاوە دەکا ‹پرتو واگرا؛ موج واگرا: تیشکی بڵاو؛ شەپۆلی بڵاو›.

**واگشت**/ vāgašt/: *اسم.* ئەواگێڵ؛ گۆڕانی باری هەڵکردنی با بە پێچەوانەی خولی کاتژمێر. بەرانبەر: **گشت**

**واگن** / vāgon ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* واگۆن: ١. هەر کام لەو ئۆدانەی قەتار کە بە لکومۆتیڤ یان ئۆدەی‌ترەوە بەستراوە ٢. هۆدەیەکی بێ‌موتور کە بە شوێن ماشێنیەوە دەبەستن ٣. *[قدیمی]* جۆرێک شەمەندەفەر کە بە ئەسپ دەکێشرا: **واگن اسبی** * **واگون**

⊡ واگن اسبی ☜ **واگن ـ٣**

**واگون** / vāgon/ [انگلیسی] ☜ **واگن**

**واگویه** / vāgûye ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* کار و ڕەوتی گەڕاندنەوە؛ گوتنەوە؛ گێڕانەوە؛ وتنەوە؛ گێڵنایوە ‹این حرف را جایی واگویه نکن!: ئەم قسە لە هیچ شوێنێک مەگێڕەوە!›.

**واگیر** / vāgîr/: *اسم.* گیرۆیی.

**واگیردار** / vāgîrdār/: *صفت.* گیرۆ؛ ئاهۆ؛ درم؛ پەژێک؛ بە تایبەتمەندی گۆزانەوە لە کەسێکەوە بۆ کەسێ‌تر و کارتێکردنی ‹خنده و گریه هم مانند برخی بیماری‌ها واگیردار هستند: گریان و پێکەنینیش وەک برێ نەخۆشی گیرۆن›.

**واگیری** / vāgîrî/: *اسم.* گیرۆیی؛ کێنج؛ دۆخ یان چۆنیەتی گیرۆ بوون.

**وال** / vāl/: *اسم.* وال: ١. [هندی] لیچەک؛ تووڵ؛

جوریَ پارچەی ناسکی شاش کە ئەو دیوی لێوە دیارە ٢. ـ/ها؛ ـان/ [یونانی/ انگلیسی] گەورەترین گیانداری زەوی کە گوانداریَکی ئاوژیە و لە ماسی دەچێ، گۆشتی دەخۆن و ڕۆنەکەی بۆ دەرمان بە کەڵکە: **باڵن، نهنگ ـ١**

**والا / vālā/**: صفت. بالا: ١. بەرز؛ سەر؛ بان؛ خاوەن پلە و پایەی گرینگ ٢. هەرەباش؛ هەرەچاک ٣. خۆشەویست؛ خوەشەویس؛ عەزیز ٤. ڕەسەن؛ نەجیب.

**والا / vāllā/**: [از عربی] *قید. [گفتاری]* وەڵلا: ١. بەخودا؛ بەخوا؛ خودیَ؛ وەڵلاهی؛ سوێندیَکە ٢. بە ڕاستی؛ بە ڕاس؛ لە ڕاستیدا ‹والا نمی‌دانم: بە ڕاستی نازانم›.

**والا / va'ellā/**: [عربی] *قید.* دەنا؛ ئەگەرنە؛ ئەگینا؛ ئەنا؛ ئننا؛ وەگەرنە؛ ئەنیا ‹سر وقت بیا، والا بیرونت می‌کنند: لە کاتی خویَدا بیَ، دەنا دەرت دەکەن›.

**والاحضرت / vālāhazrat** ، ـها/: [فارسی/ عربی] *اسم.* ڕیَزدار؛ بەڕیَز؛ سەرناویَک بۆ شازادەیان.

**والاگهر / vālāgohar/**: *صفت.* نەجیب‌زادە؛ نەجیبزا. هەروەها: **والاتبار**

**والامقام / vālāmaqām/**: [فارسی/ عربی] *صفت.* پایەبەرز؛ خاوەن پلە و پیَگەی بان و گرینگی کۆمەلایەتی و ڕامیاری.

**والان / vālān** ، ـها/: *اسم.* ١. [فرانسوی] والان؛ سەرپەردە؛ کولەپەردەیەکی جوان کە بە سەر پەردەدا هەڵیدەواسن ٢. لیَوارەیەکی چیندارە بۆ جوانی لە پاڵداویَن، سەرقۆڵ و...ی دەدەن.

**والد / vāled/**: [عربی] *اسم. [ادبی]* باب؛ باوک؛ بابە؛ تاتە.

**والده / vālede/**: [عربی] *اسم. [ادبی]* دایک؛ دایە؛ دالک؛ داک؛ دا؛ ئەدا.

**والدین / vāledeyn/**: [عربی] *اسم. [ادبی]* دایک و باب؛ دایک و باوک؛ دایە و بابە؛ ئەدا و تاتە.

**والذاریات / vazzārîyyāt/**: [عربی] *اسم. [مجازی، گفتاری]* ١. چۆرتم؛ دومات؛ تەمەرە؛ چام؛ بەلا؛ ڕۆژڕەشی؛ نەهامەتی؛ نامەتی؛ بەوبەختی؛ بەلا و موسیبەتی خراپ ٢. شین و شەپۆری بیَئاکام *

**والزّاریات**

▣ والذاریات خواندن: *[کنایی]* نالەونکە/ نکەونالە کردن؛ شین‌وشەپۆڕکردن؛ بە ناهەق گلە و سکالا کردن.

گرفتار والذاریات شدن: تووشی نەهامەتی هاتن؛ تووشی ڕۆژەڕەشی بوون؛ پیَوە بوون؛ تووشی بەلای بۆگەن هاتن.

**والریان / vāleriyān/**: [فرانسوی] ☜ **سُنبُل‌الطّیب ـ٢**

**والرین / vāleriyan/**: [فرانسوی] ☜ **سُنبُل‌الطّیب ـ٢**

**والزاریات / vazzārîyāt/**: [عربی] ☜ **والذّاریات**

**والس / vāls** ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* والس: ١. جۆریَ هەڵپەڕکیَی جووت و ئارامی ڕۆژاوایی کە لەگەڵ مووسیقایەکی تایبەتدا بەڕیَوە دەچیَ ٢. ئاهەنگی سیَ زەربی تایبەت بەم هەڵپەڕکییە.

**والسلام / vassalām/**: [عربی] *شبه‌جمله.* ١. سەلامەتیت؛ تەواو؛ تەواوبوو؛ لە بڕانەوەی قسە یان نامەدا بە کار دەچیَ ٢. چی‌ترنە؛ چی‌ترنا؛ هەر ئەمە و بەس؛ ئاویَک بیَنە و دەستان بشۆ.

**والک / vālak** ، ـها/: *اسم.* کۆڵ؛ گیایەکی گەلا پانە، بۆنیَکی توندی وەک سیری هەیە و دەخوریَت: **سیر کوهی**

**والله / vallāh/**: [عربی] *شبه‌جمله.* بەخودا؛ بەخوا؛ وەخودا؛ خودیَ؛ وەڵلا؛ وەڵلاهی؛ سویَند بە خوا.

**والو / vālv** ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* سووپاپ؛ والف؛ پارچە کانزایەکی بە تیۆپی تەگەرەوە لکاو کە وەک شیَری هەوا کار دەکا.

**والور / vālor/**: [فرانسوی] *اسم.* والۆر: ١. ـ/ها/ ناوی بازرگانی بۆ جۆریَک چرای چیَشت لیَنان کە بە نەوت دەسووتیَ و پلیتەی گردە ٢. گرینگایەتی؛ پلە و پایە لە ناو کۆمەڵدا.

**واله** / vāle(h)/: [عربی] صفت. ١. شەیدا؛ لێوە؛ هەڤینگەرم؛ هەوایی؛ شێت و هار لە دڵداریدا ٢. سەرسام؛ هەیرو؛ سەرسڕماو؛ سەرلێشێواو.

**والی** / vālî ، ـها؛ ـان/: [عربی]/اسم. [قدیمی] والی؛ پارێزگار؛ حاکمی وڵات.

**والیبال** / vālîbāl/: [انگلیسی]/اسم. والیباڵ؛ یاریەکی دوو تیمیە بە تۆڕێک لە ناوەڕاستدا کە تۆپ بۆ یەک دەهاون و نابێ بهێڵن لە ئەرز بکەوێ.

**والیبالیست** / vālîbālîst ، ـها/: [از انگلیسی]/اسم. والیباڵیست؛ یاریکەری والیباڵ.

**وام** / vām ، ـها/: /اسم. وام؛ واو؛ وا؛ ڤا: ١. کەر؛ قەر؛ قەرز؛ قەرت؛ سامە؛ سەلەف؛ پارەیێ کە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو وەردەگیردرێ و دەدرێتەوە ‹از بانک وام گرفتم: لە بانک وامم گرت›.

▣ **وام شرافتی**: وامی بێدەستەبەر؛ وامێ کە بێ ناسینی زامن یان گرەودانان دەدرێ.

▣ **وام دادن**: وام دان؛ قەرز دان. هەروەها: **وام گرفتن**

**وام داشتن**: قەرزدار بوون؛ وامدار بوون؛ قەرزار بوون؛ دانەوەی قەرزێک لە ئەستۆ بوون.

**واماندگی** / vāmāndegî/: /اسم. ١. داماوی؛ داماگی؛ کەشەنگی؛ دۆخ یان چۆنیەتی قەتیس بوون ‹از واماندگی‌اش بیرونش کردند: لەبەر داماوی دەریان کرد› ٢. دواکەوتوویی؛ پاشکەوتوویی؛ دۆخی دواکەوتن و بەجێمان.

**واماندن** / vāmāndan/: مصدر. لازم. // **واماندی**: دامای؛ **وامی‌مانی**: دادەمێنی؛ **وابمان**: دابمێنە// ١. دامان؛ قەتیس بوون؛ پەککەوتن؛ لە درێژەدان بە کارێک مانەوە ٢. بەجێمان؛ پاشکەوتن؛ لە دوا مانەوە؛ دواکەوتن؛ ڤەمان؛ کەوتنەوە ٣. ماندوو بوون؛ مانگ بوون؛ شەکەت بوون؛ ئەرخین؛ دەوخین؛ قەرمین؛ قەرملین؛ لەبکین؛ جەفلین؛ مانیەی؛ مانیای.

■ صفت مفعولی: **وامانده** (داماو)/ مصدر منفی: **وانَماندن** (دانەمان)

**وامانده** / vāmande ، ـها؛ ـگان/: صفت. ١. داماو؛ قەتیس؛ پەککەوتوو؛ پەککەوتە؛ پەککەفتی ٢. بەجێماو؛ پاشکەوتە؛ پاشکەوتوو؛ دواکەوتوو؛ دماکەوتە؛ ڤەمای؛ چەلەنگ.

**وامپیر** / vāmpîr ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. وامپیر؛ شەشەمەکوێرەی خوێنمژ؛ جۆرێ شەوکۆرەی درشتی خوێنمژ.

**وامخواه** / vāmxāh ، ـان/: /اسم. وامخواز؛ کەس یان دامەزراوەی خوازیاری وام.

**وامخواهی** / vāmxāhî/: /اسم. وامخوازی؛ کار و ڕەوتی داوای وام کردن.

**وام‌دهنده** / vāmdahande ، ـها؛ ـگان/: /اسم. وامدەر؛ قەرزدەر؛ کەس یان دامەزراوەیێ کە وام دەدات.

**وام‌گیرنده** / vāmgîrande ، ـها؛ ـگان/: /اسم. قەرزگر؛ وامگر؛ وام گیر؛ کەسێ یان دامەزراوەیێ کە وام دەگرێ.

**وان** / vān ، ـها/: [روسی]/اسم. وان؛ لەگانی گەورەی خۆ تێدا شۆردن لە حەمام.

**وانادیم** / vānād(i)yom/: [فرانسوی]/اسم. وانادیوم؛ توخمی کیمیایی کانزایی، بە ژمارەی ئەتۆمی ٢٣ و کێشی ئەتۆمی ٥٠٫٩٤، بە ڕەنگی خۆڵەمێشی کاڵ یان زێوی کە لە ئەسیددا دەتوێتەوە و وەک کاتالیزۆر بە کاری دێنن.

**وانایستادن** / vāna'îstādan/ ☜ **وایستادن**

**وانت** / vānet ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. وانیت؛ تاکسی‌بار؛ ماشینی باری بچووک بۆ هەڵگرتنی باری کەمتر لە دوو تۆن: **وانت‌بار**

**وانت‌بار** / vānetbār/: [انگلیسی/ فارسی] ☜ **وانت**

**واندادن** / vānadādan/ ☜ **وادادن**

**وانداشتن** / vānadāštan/ ☜ **واداشتن**

**وانرفتن** / vānaraftan/ ☜ **وارفتن**

**وانفسا** / vānafsā/: [از عربی] صفت. گرکاشە؛ فەرتەنە؛ نەنگواز؛ دۆخی زۆر سەخت و پڕ ئاژاوە

که هەر کەسێک تەنیا لە بیری ڕزگارکردنی خۆیدایە ‹در این روزگار وانفسا: لەم ڕۆژگارە گرکاسەدا›.

**وانگذاشتن** / vānagozāštan/ ☜ **واگذاشتن**

**وانگهی** / vāngahî/: *قید*. ئەوساکەش؛ ئەوسا؛ ئەو جار؛ ئەو جارەکەش؛ ئەو جاریش؛ ئەمجار؛ ئینجا؛ ئیمجا؛ وانگا؛ جیا لەمە ‹وانگهی این پول مال تو نیست که می‌خواهی خرجش کنی!: ئەوساکەش ئەم پارە هی تۆ نیە، وا دەتەوێ خەرجی بکەی!›.

**وانماندن** / vānamāndan/ ☜ **واماندن**

**وانمود** / vānemûd/: *اسم*. کار و ڕەوتی وانواندن؛ وانیشاندان؛ واپیشاندان؛ خستنە پێش چاوی ئاکارێکی درۆیین، بۆ خەڵک بە هەڵەدا بردن ‹وانمود می‌کرد که انگار مرا نمی‌شناسد: وای دەنواند کە گوایە نامناسێ›.

**وانیل** / vānîl ، ـها/: [فرانسوی]*اسم*. وانیل: ١. گیایەکی هەڵچووی ناوچەی ئەمریکای ناوەندی، بە گەڵای خڕی گۆشتن، گوڵی سپی و بەری بۆنخۆشەوە ٢. ماکی بۆنخۆشی بلۆرین لە توێخی بەری گیای وانیل کە بێڕەنگە و لە ئاودا دەتوێتەوە و بۆ بەهارات دەشێ.

**وانیلی** / vānîlî ، ـها/: [فرانسوی] *صفت*. وانیلی؛ وانیلدار ‹بستنی وانیلی: بەستەنی وانیلی›.

**واو** / vāv/: *اسم*. واو؛ ناوی عەرەبی سیهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

▣ **واو عطف**: واوی بادانەوە؛ واوی گەڕانەوە؛ پیتی «و» کە لە زیادکردنی وشە یان ڕستەیەک بە وشە یان ڕستەیەکی‌تر دێت (وەک من «و» تۆ).

**واو معدولە**: پیتی «و» کە دەنووسرێ و ناخوێنرێتەوە (وەک لە فارسیدا «خواهر»).

▣ **یک واو هم نینداختن** ☜ **یک**[٢]

**واویلا** / vāveylā/: [عربی] *شبه‌جملە*. هەیرۆ؛ وەیرۆ؛ ئەیەرۆ؛ واوەرێز؛ وشەیەک بۆ دەربڕینی لێقەوماوی.

▣ **واویلا بودن**: ئەستەم بوون؛ سەخڵەت بوون؛ بار و دۆخ زۆر خراپ بوون.

**واه** / vāh/: *صوت*. تەح؛ پەح؛ عای؛ ئای؛ پیف؛ پەف؛ پف؛ وشەیەک بۆ بێزاری دەربڕین لە شتێک ‹واه چه بویی!: تەح چ بۆنێ!›: **واخ**

**واهمە** / vāheme ، ـها/: [عربی]*اسم*. ترس؛ تەرسی؛ بیم؛ سام؛ سەهم؛ هەراسە؛ ئەنێش؛ ئەنێشە؛ هاس؛ خۆف؛ خۆفی؛ باک.

**واهی** / vāhî/: [عربی] *صفت*. ١. نادروست؛ ناڕاست؛ خەیاڵی ‹اتهام واهی: بوختیانی نادروست› ٢. *[مجازی]* هیچ‌وپووچ؛ پڕوپووچ؛ قۆڕ؛ پووچەڵ ‹خیال واهی؛ حرف واهی: خەیاڵی هیچ‌وپووچ؛ قسەی پڕوپووچ›.

**وای** / vāy/: *صوت*. وەی؛ ئای: ١. وەی ــ وەی؛ ئاخ؛ ئایای؛ ئۆف؛ وایش؛ ویش؛ وەخ؛ وتەی داد لە دەس ژان و ئێش ‹وای سرم!: وەی سەرم!› ٢. وای؛ داخ؛ نیشانەی هەڕەشەکردن یان بە داخ بوون ‹وای بر من!: وەی لە من!›.

**وایت‌برد** / vāytbord ، ـها/: [انگلیسی]*اسم*. تەختەسپی؛ وایتبورد؛ تەختە ئاسایەکی سفت و ساف و سپی کە بە دیواریەوە هەڵدەواسن بۆ لە سەر نووسین و چاو لێ‌کردنی دیتران (بەتایبەت قوتابیان).

**وایستادن** / vāystādan/: *مصدر. لازم. [گفتاری]* // **وایستادی**: ڕاوەستای؛ **وامی ایستی**: ڕادەوەستی؛ **وایستا**: ڕاوەستە // ڕاوەستان؛ ڕاوستان؛ وێسیان؛ وێسان؛ وەستان؛ هوسایْن؛ وسایێن؛ وسان؛ مدرەی؛ مردەی ‹وایستا ببینم کجا می‌روی؟: ڕاوەستە بزانم بۆ کوێ دەچی؟›. هەروەها: **وایستادنی**

■ صفت مفعولی: **وایستادە** (ڕاوەستاو)/ مصدر منفی: **وانَایستادن** (ڕانەوەستان)

**وایستادنکی** / vāystādanakî/: *قید. [گفتاری]* بەسەر پێوە؛ بە پێیەوە؛ بە پاوە ‹مرد گندە وایستادنکی می‌شاشید: زلحورت بەسەر پیوە دەمیزا›.

**وایکینگ** / vāykîng ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. وایکینگ؛ هەر کام لە مەلەوانانی شەرکەری سکاندیناوی لە سەدەکانی ٩ تا ١١ی زایینیدا کە هێرشیان دەبردە سەر ولاتانیتر و جارجار لەوێ نیشتەجێ دەبوون، بەلام زۆرتر ولاتانی کنارێنیان تالان دەکرد.

**وبا** / vabā/: [عربی]/اسم. وەبا؛ یەختەسار؛ کول؛ کولک؛ درووشە؛ ئاهۆ؛ چاوقوولکە؛ فەتا؛ چاوقوولی؛ درمی رشانەوە؛ پەتایەکی تووشی ناوچەی گەرمێن کە مرۆ تووشی زگەشۆرە، رشانەوە، سارد بوونەوە، کەم بوونەوەی ئاوی لەش و لە ئاکامدا خەست بوونەوەی خوێن و شین و رەش هەلگەرانی پێست دەکا.

▣ **وبای التور**: وەبای ئەلتور؛ نەخۆشیەکی وەکوو وەبا بەلام سووکتر.

**وبال** / vabāl/: [عربی]/اسم. ١. سەخلەتی؛ تووشی؛ دژواری؛ سەختی؛ دەردیسەر؛ زاول ٢. ئاز و باز؛ تاوان؛ گوناه ؛ ئۆبال؛ وەبال.

▣ **وبال گردن شدن**: بوونە چەل و مل؛ بوونە لکی مل؛ بوونە باری سەرشان ‹این ماشین قراضه هم وبال کردن شده، نه می‌شود تعمیرش کرد، نه می‌شود فروخت: ئەم ماشینە ئاسنجاوەش بونە چەل و ملمان، نە چاک دەبێتەوە، نەش دەفرۆشرێ›.

**وتر** / vatar ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. *[کالبدشناسی]* بەندۆک؛ بەندۆکە؛ بەندۆل؛ سیرمەئاسای نیو جومگە کە سەری ئێسک رادەگرێ ٢. *[هندسه]* وەتەر؛ لاسکی رووبەرووی گۆشەی ٩٠° لە سێ‌گۆشەدا ٣. *[هندسه]* وەتەر؛ لەتە خەتێکی راست کە جەغز دەکاتە دوو بەشی نابەرامبەرەوە.

**وتو** / veto/: [فرانسوی]/اسم. ویتۆ؛ ڤیتۆ: ١. بەرگری زۆردارانە ‹وتو کردن: ویتو کردن› ٢. دەسەلاتی کەس یان دامەزراوەیەک لە هەلوەشاندنەوەی کار یان بریارێکدا ‹حق وتو: مافی ویتو›.

▣ **وتو کردن**: ویتۆ/ ڤیتۆکردن؛ هەلگەرانەوە و پووچەل‌کردنەوەی بریاری شاند و کۆرێکی قانوونی ‹آمریکا تحریم علیه اسرائیل را وتو کرد: ئەمریکا ئابلۆقە دژی ئیسرائیلی ڤیتو کرد›.

**وثوق** / vosûq/: [عربی]/اسم. بروا؛ باوەر؛ دلنیایی؛ ئارخەیانی؛ خاترجەمی؛ متمانە؛ رابینی.

**وثیقه** / vasîqe ، ـها/: [عربی]/اسم. گرەو؛ بارمتە: ١. پارە و مالێ کە بۆ دلنیا کردنی کەسێک تا بەرێوە چوونی بەلێن پێی دەسپێردرێ ٢. مالێ کە کاتی گرتنی وام بە لای وامدەرەوە دایدەنێن کە هەرگا وامەکەی درایەوە، ئەویش بیداتەوە ‹بانک وثیقه می‌خواست، سند خانه را وثیقه گذاشتم: بانک بارمتەی دەویست، سەنەدی مالەکەم نایە کردو›.

**وج** / vac/ ☜ **اوجا**

**وجاهت** / vecāhat, vacāhat/: [عربی]/اسم. *[ادبی]* ١. جوانی؛ قەشەنگی؛ زەریفی ‹وجاهت منظر: جوانی دیمەن› ٢. خۆشەویستی ‹وجاهت سیاسی: خوشەویستی رامیاری› ٣. گونجاوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی گونجاو بوون ‹وجاهت قانونی: گونجاوی قانوونی›.

**وجب** / vacab/: اسم. بست؛ بس؛ بنگوست؛ بوهوست؛ بنگس؛ بنگووس؛ بۆست؛ بنست؛ بوست؛ بهۆست؛ بهوست؛ بنگست؛ بنگز؛ بنگێس؛ بۆس؛ یەسە؛ گێر؛ گەر؛ وەژە؛ ویژە؛ یەکەی درێژایی کە دەکاتە سەری تووتە تا سەری قامکە گەورە، بە بلاوی دەوری ٢٥ سانتی‌میتر.

▣ **وجب کردن**: بست‌کردن؛ بنگووس‌کردن؛ یەس‌کەردەی؛ وەژەکردن؛ پێوانی ئەندازەی شتێک بە بس.

**وجبی** / vacabî/: قید. بە بست؛ بە بنگووس؛ بە یەسە ‹وجبی اندازه گرفتم: بە بنگوس پێوام›.

**وجد** / vacd/: [عربی]/*اسم. [ادبی]* خۆشی؛ شادی؛ کەیفخۆشی؛ دڵخۆشی؛ خۆشحاڵی؛ کەیف: ١. شایی وێڕای چەپڵە لێدان و هەڵپەڕین ‹بچەها چە وجدی می‌کردند: منداڵەکان چ خۆشیەکیان دەکرد› ٢. شاگەشە؛ ئەو شادیەی لەش دێنێتە جمۆجووڵ ‹همە بە وجد آمدە بودند: هەمووان شاگەشکە ببوون›.

**وجدان** / vocdān, vecdān/: [عربی]/*اسم.* دەرف؛ نهاد؛ قەرە؛ ویژدان؛ هەستی دڵ و دەروون لە ئاست چاکە و ڕق لە خراپە کە مرۆ بۆ چاکە هان دەدا.

**وجدانا** / vocdānan, vecdānan/: [عربی]*قید.* بەویژدان؛ ویژدانەن؛ لە ڕووی ویژدانەوە ‹وجداناً حق با اوست: بەویژدان ئەو ڕاست دەکا›.

**وجدانی** / vocdānî, vecdānî/: [عربی] *صفت.* ویژدانی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە ویژدان ٢. پێوەندیدار بە خووخدە، حاڵ و وازی دەروون ‹دین در شمار مسائل وجدانی است: دین وەکوو چەمکێکی ویژدانی دێتە ئەژمار›.

**وجنات** / vacanāt/: [عربی]/*اسم.* ناوچاو؛ دیمەن؛ ڕوومەت؛ دەم و چاو؛ جەمین؛ ئەندامانی دەم و چاو، بەتایبەت ئەوانەی کە هەست و حاڵی مرۆ بنوێنن ‹ترس و شرمساری در وجنات او نمایان بود: ترس و شەرمەزاری بە ناوچاویدا دیار بوو›.

**وجوب** / vucûb, vocûb/: [عربی]/*اسم.* پێویستی؛ دۆخ یان چۆنیەتی پێویست بوون.

**وجود** / vucûd, vocûd/: [عربی]/*اسم.* ١. دۆخ یان چۆنیەتی هەبوون؛ بوون؛ بووین؛ بین؛ بیەی؛ هەبین؛ هەبوونی شتێک لە شوێنێک ‹در اینجا چیزی وجود دارد: لێرەدا شتێک هەیە› ٢. هەبوو؛ هەسی؛ هەستی؛ بیەی؛ زات؛ کۆمەڵە شتانی ئەو دنیایە ٣. گیان؛ ئازای ئەندام؛ تەن؛ قەوارە؛ لەشی بوونەوەری زیندوو ‹ترس همەی وجود او را فراگرفتە بود: ترس هەموو گیانی داگرتبوو› ٤. *[مجازی]* کەس؛ بوونەوەر ‹وجود نازنینی است: بوونەوەرێکی نازارە›.

◘ وجود خارجی: بوونی ڕاستەکی/ دەرەکی؛ بار و دۆخی بوون لە دەرەوەی خەیاڵ و ئاوەزدا.

وجود ذهنی: بوونی زەینی/ خەیاڵی؛ بار و دۆخی بوون لە خەیاڵ و زەیندا.

وجود عینی: بوونی بەرهەست/ بەرچاو؛ بار و دۆخێک لە بوون کە بەر هەست بکەوێ.

◘ وجود داشتن: بوون؛ هەبوون؛ هەبین؛ بین؛ بیەی.

بە وجود آمدن: پێکهاتن؛ بەدیهاتن؛ وەدیهاتن. هەروەها: **بە وجود آوردن**

**وجودی** / vucûdî, vocûdî/: [عربی] *صفت.* هەبوونی؛ پێوەندیدار یان سەر بە بوون ‹فلسفەی وجودی آن چیست؟: فەلسەفەی هەبوونی (ئەو) چیە؟›.

**وجوه** / vucûh, vocûh ، ـات/: [عربی] جمعِ ☜ **وَجْه**

**وجوهات** / vucûhāt, vocûhāt/: (!) [عربی] جمعِ ☜ **وَجْه**

**وجه** / vach، وُجوه/: [عربی]/*اسم.* ١. /وُجوهات/ پارە؛ دراو؛ دراڤ؛ پوول ‹وجە نقد: پارەی نەخت› ٢. شێوە؛ شێواز؛ تەرز؛ جۆر؛ کلۆج؛ کولۆج؛ چەشن ‹بە هر وجە بود از دستش فرار کردم: بە هەر شێوەیەک بوو لە دەستی هەڵاتم› ٣. هۆ ‹وجە تسمیە: هۆی ناونیان› ٤. *[دستور]* دۆخ؛ شێواز ‹وجە اخباری: دۆخی هەواڵی› ٥. پاڵوو؛ پاڵ؛ هەر کام لە ئاستگەڵی دەرەوەی تەنێکی هیندسی.

◘ وجە احسن: شێوازی جوان؛ شێوەی جوان؛ باشترین بیچم؛ جوانترین شێوە.

وجە اخباری: *[دستور]* دۆخی هەواڵی؛ کرداری کە هەواڵ بدات (وەک ڕۆشتم، دەهات، بردی).

وجە اشتراک: خاڵی هاوبەش؛ باری هاوبەشی ‹وجە اشتراک آنها علاقە بە کتاب‌های علمی بود: خاڵی هاوبەشیان هۆگری بە کتێبی زانستی بوو›.

وجە التزامی: *[دستور]* دۆخی هاوڕێیی؛ کرداری

که وشـەیەکی تـری ڕەگەڵـە (وەک دەمـەویٚ بڕۆم، خەریکم دیٚم، ناتوانیٚ بیخوا).
وجه امتیاز: هۆی سەرپشکی/ هەڤیازی.
وجه تسمیه: هۆی ناونان.
وجه تشبیه: باری لێکچوون.
وجـه دسـتی: دەسـقەرز؛ دەسـەوام؛ قـەرزی دەسـاودەس و بـەبیٚ بەڵـگە و گـرەو ‹از دادن نسیه و وجه دستی معذوریم: قەرز و دەسقەرز، باسی مەکە!›.
وجه شرطی:*[دستور]* کرداریٚ که مەرجی هەیه (وەک ئەگەر بێت).
وجه ضمان: پارەی گرەو؛ پارەی بارمتـە؛ پـارە یان مالیٚ که وەک بارمته به دادگا یان پلـه و پایەی قانوونی دەسپێرن ‹برای متهم قـرار یـک میلیون وجه ضمان صادر شد: بـۆ تاوانبـار ملیۆنێـک پارەی گرەو بڕیار درا›.
وجه مصالحه: ئەو شته که بۆ پێکهاتی ئاشـتی نێوان دوو لایەن، دەکەوێته بەر سەوداوە.
در وجه: بۆ؛ بە؛ ژبۆ؛ لەبەر ‹در وجه حامل پرداخت شود: به هێنەر بدریٚ›.
**وجهه** / veche/: [عربی]*اسم.* ئابروو؛ وەج ‹بـا ایـن کار وجهەی خودش را خراب کرد: بـەم کـارە ئابـرووی خۆی برد›.
▣ **وجهەی همت ساختن/ قرار دادن:***[ادبی]* شان لیٚشل‌کردن؛ قۆڵ لیٚ هەڵـکردن/ هەڵماڵـین؛ چاک لیٚ هەڵکردن؛ چاک لیٚ بـەلادا کـردن؛ خۆ بۆ تاو دان؛ هەوڵ و تەقالای بەردەوام دان ‹آموختن زبان را وجهەی همت ساخت: شـانی لـیٚ شل کرد زمان فێر ببیٚ›.
**وجین** / vecîn/:*اسم.* بـژار؛ بـژارە؛ ئـادە؛ ئاویـە؛ کاخ؛ وجێس؛ خەپار؛ کشـکە؛ سـلمتە؛ حـەپارە؛ کاژەنـگ؛ وجێـز؛ وجـز؛ وژن؛ ناوەژیـە؛ کـاری خاوێن‌کردنەوەی مەزرا لە گژ و گیای خۆڕسکی بیٚ‌کەڵک.
**وجیه** / vacîh/: [عربی] *صفت.[ادبی]* ۱. جـوان؛ خان‌ومان؛ شەنگ ۲. خۆشەویست.
**وجیه‌المله** / vacîholmelle ، ـها/: [عربی] *صفت. [ادبی]* خۆشەویستی خەڵک؛ لە نێو دڵی خەڵک.
**وحـــدانیت** / vahdānîyyat/: [عربـــی]*اســم.* تاقانـــەیی؛ تـــەنێتی؛ یەکایـــەتی؛ تـــەنیایی؛ بیٚ‌هەواڵەتی؛ تاکانەیی؛ تاکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی تاقانه بوون ‹مسـلمان بـه وحـدانیت خـدا اعتقـاد دارد: موسوڵمان به تاقانەیی خودا باوەڕی هەیە›.
**وحـــدت** / vahdat/: [عربـی]*اسـم.* یەکیـەتی؛ یەکەتی: ۱. یەکبوونی؛ دۆخ یان چۆنیەتی یەک بوون ‹وحدت رویه: یەکبەتی ڕێبـاز› ۲. یـەکگری؛ یەکگرتوویی؛ هەڤگری ‹وحدت نیروها؛ وحدت مردم: یەکگری هێزەکان؛ یەکگرتوویی خەڵک›.
**وحـــدت‌وجـــود** / vahdatevucûd, -vocûd/: [عربی]*اسم.* هەرخودایی: ۱. ئایینـیٚ کـه هـەموو هێزێکی سروشت به خودا دەزانیٚ: **همـەخـدایی** ۲. ئایینـــیٚ کـــه خـــودای هـــەموو ئایینـــەکان دەپەرستیٚ و به یەکیان دەزانیٚ.
**وحدت‌وجودی** / vahdatevucûdî, -vocûdî/: [عربـــی] صـــفت. ۱. شـــوێنکەوتـــووی ئـــایینی هەرخودایی ۲. پەیوەندیدار یان سەر بە ئـایینی هەرخودایی.
**وحش** / vahš ، وُحوش/: [عربـی]*اسـم.* لاور؛ ڕاور؛ کێوی؛ کێفی؛ دەشـتەکی؛ هـۆڤ ‹حیات وحش: ژیانی لاور›.
**وحشـــت** / vahšat/: [عربـــی]*اســـم.* تۆقـــاوی؛ هەڵەتاوی؛ زەرتلاق؛ سیبەن؛ ترسی زۆر.
▣ **وحشت داشتن:** یەکجار ترسان؛ هەڵەتاو بوون ‹از مـوش وحشـت داشـت: لـه مشـک یـەکجار دەترسا›.
وحشت کردن: تۆقین؛ تۆقیان؛ تۆقـەی؛ زیـرە کردن؛ دڵ نەمان؛ ڕۆح تۆقین؛ زاڵە تـرەکین؛ زاڵەترەک بوون؛ زاور چوون ‹از دیـدن قیافـەاش وحشت کردم: لە دیتنی سەر و سەکوتی تۆقیم›.
به وحشـت افتادن: تۆقیـان؛ دڵ/ ڕۆح تۆقـان؛

زاڵە ترەکان؛ ڕۆح/ دڵ نەمان؛ زیرە کردن؛ تووشی ترسی زۆر هاتن ‹با شنیدن آن خبر به وحشت افتاد: کە ئەو هەواڵەی بیست، توقا›.

**وحشت‌آور** / vahšatāvar/: [عربی/ فارسی] صفت. تۆقێنەر؛ ڕۆح‌تۆقێن؛ زاڵەترەکێن؛ زارۆبەر؛ هۆی ترسی زۆر.

**وحشت‌انگیز** / vahšatangîz/: [عربی/ فارسی] صفت. تۆقێنەر؛ زارۆبەر؛ زاڵەترەکێن.

**وحشت‌زده** / vahšatzade/: [عربی/ فارسی] صفت. تۆقاو؛ تۆقا؛ تۆقیاگ؛ زاڵەترەک؛ زارۆچووگ ‹دیروز عمه را دیدم خیلی وحشت‌زده به نظر می‌رسید: دوێنێ پوورم دی زۆر توقاو ئەهاتە پێش چاو›.

**وحشتناک** / vahšatnāk/: [عربی/ فارسی] صفت. سامناک؛ سامدار؛ تۆقینەر؛ زارۆبەر.

**وحشی** / vahšî ، ـها/: [عربی] صفت. ١. کێوی؛ کێڤی؛ کوویەی؛ کوی؛ دەشتی؛ بە ژیانێکی تەواو سروشتی و دوور لە خەڵک ‹اسب وحشی: ئەسپی کێوی› ٢. خۆڕسک؛ خۆرست؛ خۆڕست؛ کێوی؛ کەشی؛ ڕەخساو و سەرهەڵداو بێ ئەوەی مرۆ دەستی تێدا بێ یان بیپارێزێ ‹بادام وحشی: بادامی خورسک› ٣. بەون؛ بوور؛ بۆرە؛ دەژ؛ بەیار؛ بەیاز؛ نەکێڵدراو و ئامادە نەکراو بۆ ژیان ‹سرزمین وحشی: زەوینی بەون› ٤. دڕ؛ دڕندە؛ واهش؛ سەربزێو؛ دوور لە بنەما سەرەکیەکانی کۆمەڵگا ‹بر اثر خشم وحشی شده بودند: لە بەر تووڕەیی دڕ ببوون› ٥. چەتوون؛ نەپارێز؛ خاوەن جموجووڵ و هەڵسووڕانی زۆر ‹توفان وحشی: گژەبای چەتوون› ٦. ـان//[تعریض] دەشتەکی؛ کێفیلە؛ بێوەری لە ژیار و فەرهەنگ.

**وحشیانه** / vahšiyāne/: [عربی/ فارسی] قید. ١. بە پەت براوی؛ بە پەت پساوی؛ بەبێ تێرامان و کۆ کردنەوە ٢. بە بەرەڵایی؛ بە شێوەی دوور لە بنەمای کۆمەڵایەتی ٣. بە دڕندەیی؛ دڕندانە.

**وحشیت** / vahšîyyat/: [عربی]/اسم. دڕندایەتی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی دڕندە/ دڕ بوون ٢. دڕندەخۆیی.

**وحشیگری** / vahšîgarî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. دڕندەیی؛ دڕندەخۆیی؛ هۆڤیتی؛ هۆڤینی: ١. ئاکاری جەنایەتکارانە ٢. کردەوەی نەگونجاو و پێچەوانەی نەریتی ژیار و فەرهەنگ.

**وحوش** / vohûš/: [عربی] جمعِ ☜ **وَحش**

**وحی** / vahy/: [عربی]/اسم. پێخەم؛ وەحی؛ پەیامی ئاسمانی؛ پەیامی خودایی؛ پەیام یان وریا کردنەوەیەک لە لایەن خوداوە بۆ کەسێ (بەتایبەت پێغەمبەران).

**وخامت** / vexāmat/: [عربی]/اسم. ناڵەباری؛ تووشی؛ دۆخ یان چۆنیەتی جێ‌مەترسی بوون ‹وخامت اوضاع؛ وخامت بیماری: ناڵەباری بار و دۆخ؛ ناڵەباری نەخۆشی›.

**وخیم** / vaxîm/: [عربی] صفت. ١. ناڵەبار؛ ناخۆش؛ تووش ‹وضع وخیم: دۆخی ناڵەبار› ٢. پڕمەترسی؛ سەخت؛ جێ مەترسی ‹بیماری وخیم: نەخۆشی پڕمەترسی›.

**وداد** / vedād/: [عربی]/اسم. [ادبی] دۆستی؛ دۆستایەتی.

**وداع** / vedā'/: [عربی]/اسم. [ادبی] ماڵاوایی؛ ماڵاڤایی؛ خواحافیزی.

▣ وداع کردن/ گفتن: ماڵاوایی کردن؛ خواحافیزی‌کردن ‹با ما وداع کرد: لەگەڵ ئێمەدا ماڵاوایی کرد›.

**ودایع** / vadāye'/: [عربی] جمعِ ☜ **ودیعه**

**ودکا** / vodkā/: [روسی]/اسم. ودکا؛ خواردنەوەیەکی ئەلکولی بێ‌ڕەنگە، لە ئەلکولی سروشتی گەنم درووس دەکرێ.

**ودیعه** / vadî'e ، ـها؛ ودایع/: [عربی]/اسم. سپاردە؛ ئەسپاردە؛ بارمتە؛ تەڵپ؛ گرک؛ گرەو: ١. پارەیەک وا بۆ دەستەبەری جێبەجێ کردنی کارێک لای کەسێکەوە دادەنرێ ٢. شتێ کە بە ئەمانەت بۆ ماوەیەک بە کەسێ دەسپێردرێ.

**ور**[1] / var/: اسم. ١. [گفتاری] لا؛ ئالی؛ نک؛ بەر؛

وەر ‹این ور؛ آن ور: ئەم لا؛ ئەو لا›.

**ور-**[۲]: پیشوند. [گفتاری] هەڵ-؛ ئەل-؛ هل-؛ هن-؛ هۆر-؛ وەر- ‹ورافتادن؛ ورچیدن: هەڵپێچان؛ هەڵچنین›.

**-ور**[۳]: پسوند. - دار؛ - وەر؛ - ئەوەر ‹نامور؛ بهرەور: ناودار؛ بەهرەوەر›.

**ور** / vare/: حرف. [گفتاری] لە پەنا؛ لە پەنای؛ لە کن؛ لە پاڵ؛ پاڵ؛ تەنیشت؛ لە تەنیشت؛ لە لای؛ لاو ‹ور دیوار نشسته بود: لە پەنا دیوارەکە دانیشتبوو›.

**ور** / ver/: اسم. [تعریض، گفتاری] وڕ؛ چەنە؛ چناکە؛ چەناکێ؛ قسەی قۆڕ؛ هەڵیتوپەڵیت؛ قسەی زۆر و بێتام.

◘ ور زدن: وڕ لێدان؛ فرەوێژی کردن؛ وڕاجی کردن؛ چەنە لێدان؛ چناکە دان؛ چەناکە دای.

**-ور** / ûr/: پسوند. - دار؛ - وەر؛ -ەوەر؛ خاوەنی شتێک ‹رنجور؛ گنجور: ڕەنجدار؛ گەنجدار›.

**ورا** / varā/: [عربی]/اسم. ۱. ئەوپەڕ؛ ئەودیو؛ ئەولا ‹در ورای درختان سایەای دیده می‌شد: لە ئەوپەڕی دارەکانەوە سێبەرێک بەدی دەکرا› ۲. بان؛ سەر؛ ژوور ‹در ورای ابرها پرواز می‌کرد: لە بان هەورەوە دەفڕی›.

**وراث** / vorrās/: [عربی] جمعِ ☜ **وارث**

**وراثت** / verāsat/: [عربی]/اسم. ۱. میراتگری؛ میراتبەری؛ شرەگری؛ دۆخی پێگەیشتنی ماڵ، پلە و پایە یان چۆنیەتیەک لە مردووانەوە ۲. دۆخی میرات بردن ۳. کێشانە سەر؛ ڕەوتی پێگەیشتنی بڕێک تایبەتمەندی لە دایک و باوک یان باب و باپیرانەوە ٤. ژنیتیک.

**وراثتی** / verāsatî/: [عربی] صفت. میراتی؛ پێگەیشتوی؛ بۆماوەیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە میرات.

**وراج** / verrāc، ـها/: [از عربی] صفت. [گفتاری] درێژدادڕ؛ چەنەباز؛ هەرەوەڕ؛ هەرزەبێژ؛ چەنەدرێژ؛ چەناگەدرێژ؛ چەڵتەباز؛ گاڵەگوڕی؛ چەقەسرۆ؛ زۆروەڕ؛ وڕاج؛ لاکێش؛ گیر؛ بێژۆک؛ پنات؛ چناکەشکیاگ؛ چەناکەمڕیا؛ ئاواوۆک؛ دەڤەڕۆ؛ هەرزەچەنە؛ دەڤەژەن؛ دەمدرێژ؛ بەکێش؛ بەڵەبڵ؛ بەجوج؛ چەنەوەر؛ دەلوقەل: ۱. گەوجانەڕێس؛ لەوجڕ؛ دەمگەوج؛ مفتبێژ؛ چەڵتەکەر؛ قسەی مفتکەر ۲. زۆربلێ؛ فرەوێژ؛ فرەبێژ؛ بەدەم؛ کەرنڕ؛ قسەی فرەکەر.

**وراجی** / verrācî، ـها/: [از عربی]/اسم. [گفتاری] زۆربێژی؛ درێژدادڕی؛ چەنەبازی؛ چەقەسرۆیی؛ لاکێشی؛ لەوتلەوت؛ چەڵتەچەڵت؛ چنەچن؛ تڕەتڕ؛ گێژەگێژ؛ وڕە؛ چەنەبازی؛ وڕەوڕ؛ چەقەکەری؛ گیە؛ گیرە؛ دەمهەراشی؛ دەڤەژەنی؛ دەمدرێژی؛ چەنەوەری.

**ورآمدن** / varāmadan/: مصدر. لازم. // **ورآمدی:** هەڵکەنرای؛ **ورمی‌آیی:** هەڵدەکەنرێی؛ **وربیا:** هەڵکەنرێ// ۱. هەڵکەنران؛ هەڵکەنیان؛ هەڵکنیان؛ هەڵکەندران؛ هەڵکنران؛ دەرهاتن؛ لێوە بوون؛ هۆرکنیەی ‹کشیدم، دسته‌اش ورآمد: کێشام، دەستەکەی هەڵکەندرا› ۲. ماسین؛ هەڵماسین؛ ماسەی؛ هەڵپەنەمین؛ پەنەمیان؛ با کردن؛ وا کەردەی ۳. هەڵاتن؛ هەڵهاتن؛ هۆرئامەی؛ پفەک/ پەتلەککەردەی؛ ئامادە بوونی هەویر.

■ صفت مفعولی: **ورآمده** (هەڵکەنراو)/ مصدر منفی: **ورنیامدن** (هەڵنەکەنران)

**ورافتادن** / varoftādan/: مصدر. لازم. [گفتاری] هەڵپێچران؛ هەڵپێچان؛ هەڵپێچیان؛ هەڵپێچرانەوە؛ هۆرپێچیایوە؛ هۆرەوەپیچیەی؛ فەوتان؛ فەوتیان. هەروەها: **ورافتادنی**

■ صفت مفعولی: **ورافتاده** (هەڵپێچراو)/ مصدر منفی: **ورنیفتادن** (هەڵنەپێچران)

**وارانداختن** / varandāxtan/: مصدر. متعدی. [گفتاری] ڕووخاندن؛ هەڵوەشاندن؛ تێکدان؛ لە ناو بردن؛ خاپوورکردن؛ ڕماندن؛ تێدا بردن؛ هەڕشاندن؛ هەڕفاندن؛ وڕنەی؛ وڕنای؛ ناسەی؛

نەهێشتن.

**وراندار** / varandāz/: *اسم. [گفتاری]* بەراورد؛ کار و ڕەوتی هەڵسەنگاندن؛ هێژاندنی شتێ یان کەسێک هەر بە چاو.

**وڕپریدن** / varparîdan/: *مصدر. لازم. [گفتاری]* // **وڕپریدی**: فجیقت کرد؛ **ورمی پری**: فجیق ئەکەی؛ **وِڕپڕ**: فجیق کە// فجیق کردن؛ پەڕماسەی؛ کتوپڕ/ کوتوپڕ کردن؛ تووشی مفاجا بوون.

■ صفت‌مفعولی: **وڕپریده** (فجیق کردوو)/ مصدرمنفی: **ورنپریدن** (فجیق نەکردن)

**وڕپریده** / varparîde ، ـها/: *صفت. [گفتاری]* گلاراو؛ کوتوپڕ: ١. کوتوپڕ کوشتوو؛ فجیق‌کردوو؛ قرپە لێ‌کەوتوو؛ قرپە لێ‌کەفتگ؛ چووزەنەپڕا؛ پەڕماسا؛ ئۆڕناقی؛ هار و هاجی ئازاردەر، بەتایبەت بۆ منداڵ (جۆرێک جنێوە) ‹آهای وڕپریده! تا حالا کجا بودی؟: هۆی کوتوپڕ کوشتوو! تا ئێستا لە کوێ بووی؟› ٢. بە هێماوە و بۆ خۆشەویستی بە کەسێکی دەڵێن ‹وڕپریده چقدر خوشگل شده!: گلاراوە چەند جوان بووە!›.

**ورثه** / varase/: [عربی] جمعِ ☜ **وارِث**

**ورجه ـ وورجه** / varcevûrce/: *اسم. [گفتاری]* هەڵبەز ـ دابەز؛ جرت‌وفرت؛ هەڵپەڕ ـ داپەڕ؛ قونەقون؛ وەرجسە؛ وەرچسە؛ هەڵقون ـ هەڵقون؛ هەڵتیق ـ داتیق؛ هەڵخەوداخە؛ هەرەزیلکان؛ کاری هەڵتیقان و جریتان‌کردن ‹بچه‌ها توی اتاق ورجه ـ وورجه می‌کردند: منداڵەکان لە دیوەکەدا هەڵبەز ـ دابەزیان دەکرد›.

**ورجهیدن** / varcahîdan/: *مصدر. لازم.* هەڵبەزین؛ قەفازتن؛ پەڕین؛ ڕاپەڕین؛ لوونایش؛ لوونایش؛ هەڵوەزین؛ قەگەمزین؛ لۆقژین؛ جامبازە کردن؛ بازبازان کەردەی. هەروەها: **ورجهیدنی**

■ صفت مفعولی: **ورجهیده** (هەڵبەزیو)/ مصدر منفی: **ورنجهیدن** (هەڵنەبەزین)

**ورچیدن** / varčîdan/: *مصدر. متعدی. [گفتاری]* ١. چنینەوە؛ ئەوەچنیەی؛ هەڵگرتنەوەی پرژاو ٢. ماشتنەوە؛ ئەوەماشتەی ٣. هەڵگرتن؛ هەڵپێچاندن. هەروەها: **ورچیدنی**

■ صفت مفعولی: **ورچیده** (چنراوە)/ مصدرمنفی: **ورنچیدن** (نەچنینەوە)

**ورد** / vard/: [معرب از پهلوی] *اسم. [قدیمی]* ١. گوڵباخی؛ ولی؛ گوڵی سوور ٢. [عربی] گوڵ.

**ورد** / verd ، ـها؛ اُوراد/: [عربی] *اسم.* ١. ورد؛ ویرد؛ دوعای ژێر لێوان ٢. جەلجەلووت؛ پرتە؛ ورت؛ ورتە؛ گوتەی سەیر و بێ‌مانای جادووگەران.

◙ **ورد زبان**: قسەی سەرزار؛ قسەی سەر زوان؛ قسەی دەم؛ قسەیێ کە لە پەستا دەیڵێنەوە ‹همیشه ورد زبان او پول بود: هەمیشە قسەی سەر زاری پارە بوو›.

**وردار ـ ورمال** / vardārvramāl/: *صفت. [گفتاری]* هەرچی ـ پەرچی؛ لۆتی ـ پۆتی؛ ساختەچی و بێ‌شەرم.

**ورداشتن** / vardāštan/: *مصدر. متعدی. [گفتاری]* هەڵگرتن؛ هۆرگێرتەی؛ ئەڵگرتن. هەروەها: **ورداشتنی**

■ صفت مفعولی: **ورداشته** (هەڵگیراو)/ مصدر منفی: **ورنداشتن** (هەڵنەگرتن)

**وردست**[1] / vardast ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* بەردەست؛ بەردەس؛ یاریدەر؛ یارمەتیدەر؛ ئاریکار؛ دەسیار ‹شده بود وردست نانوا: ببووە بەردەستی نانەوا›.

**وردست**[2]: *قید. [گفتاری]* (لە) بەردەست؛ لە ژێردەس ‹وردست بنا کار می‌کرد: لە بەردەستی بەنادا کاری دەکرد›.

**وردنه** / vardane ، ـها/: *اسم.* نابوونیک؛ نابووینک؛ نابینک؛ وەردێنە؛ وەردەنە؛ وەردێنکە؛ وەردانە؛ وەردێنک؛ تیرەنان؛ بازی؛ کەسمەبڕ؛ تیرۆکی ئەستووری هەویر پان‌کردنەوە.

**وررفتن** / var.raftan/: *مصدر. متعدی. [گفتاری]* //

**وررفتی:** پێوە چووی؛ **ورمی‌روی:** پێوە دەچی؛ **وربرو:** پێوە بچۆ // پێوە چوون: ۱. دەس تێوەردان بۆ: *الف)* پشکنین *ب)* ڕێک‌وپێک کردن؛ تەکووز کردن *ج)* گەمەکردن؛ کایەکردن ۲. سەر تێ‌کردن؛ پێوە پەرژان ‹مدتی با آن وررفتم: ماوەیەک سەرم تێ‌کرد› ۳. پێدا چوونەوە؛ لێکدانەوە ‹قدری با آن مقاله وررفتم: نەختێ بەو وتارەوە چووم› ٤. *[مجازی]* لۆکاندن؛ ئاوقا بوون؛ ئاوقە بوون ‹گفتم این‌قدر با آن دختر ورنرو کار دستت می‌دهد: گوتم هێند بەو کچەوە مەچو، تووشت دەکا›. هەروەها: **وررفتنی**

■ مصدر منفی: **ورنَرفتن** (پێوە نەچوون)

**ورز**[1] / varz/: [کردی] *اسم. [نامتداول]* وەرد؛ کەش؛ کارێ کە دووپاتە و چەن‌پاتە ببێتەوە.

▣ **ورز دادن:** وەرد دانەوە؛ وەرزین؛ هەڵولاین؛ ماڵین و شێلان و تێکەڵ‌کردن ‹ورز دادن خمیر: وەرد دانەوەی هەویر›.

**ـورز**[2]: *پیوأژه.* ـگێڕ؛ ئەنجامدەری کارێک ‹کاروَرز: کارگێر›.

**ورزا** / varzā ، ـها/: [کردی] *اسم.* وەرزا؛ وەرزە؛ گای جووت: **ورزاو**

**ورزاو** / varzāv/: [کردی] ☜ **ورزا**

**ورزش** / varzeš ، ـها/: *اسم.* وەرزش: ۱. چالاکی ڕێک‌وپێک و بە بەرنامە بۆ بار هێنان و پاراستنی لەش ۲. کاری ڕاهێنان؛ ئەو کارەی بۆ ڕاهاتن و پاراستنی ژێهاتوویی دەکرێ.

▣ **ورزش آبی:** وەرزشی ئاوی؛ ئەو وەرزشانەی دە نێو ئاودا دەکرێن (وەکوو مەلە، خلیسکێنی سەر ئاو و...)

**ورزش آماتوری:** وەرزشی ئاماتۆری؛ وەرزشێ کە ئیش و پیشەی وەرزشکار نیە. بەرانبەر: **ورزش حرفه‌ای**

**ورزش انفرادی:** وەرزشی تاکەکەسی؛ هەر کام لەو وەرزشانەی بە تەنیایی ئەنجام دەدرێن، واتە وەرزشکار بە تەنیایی دەچێتە مەیدانی حەریفەکەی (وەک زۆرەبانی، مشتێن و...).

بەرانبەر: **ورزش تیمی**

**ورزش باستانی:** وەرزشی باستانی؛ وەرزشی زۆرخانەیی؛ هەر کام لە وەرزشە خۆماڵیەکانی ئێران کە لە زۆرخانەدا بەڕێوە دەچێ.

**ورزش تیمی:** وەرزشی یانەیی؛ یاریێ کە چەن‌کەسی بەڕێوە دەچێ. بەرانبەر: **ورزش انفرادی**

**ورزش حرفه‌ای:** وەرزشی پیشەیی؛ وەرزشێ کە دەبێتە پیشە و کاری وەرزشکار. بەرانبەر: **ورزش آماتوری**

**ورزش رزمی:** وەرزشی ڕەزمی؛ وەرزشێ کە وەرزشکار بۆ بەربەرەکانێ ڕادێنێ (وەک جودۆ، کونگ‌فۆ، کاراتە و...).

**ورزش زمستانی:** وەرزشی زستانی؛ ئەو وەرزشانەی تەنیا لە زستاندا دەرەخسێن (وەک خلیسکێن، پاتیناژ).

**ورزش سوئدی:** وەرزشی سوێدی؛ ئەو جم‌وجووڵە نەرمانەی بۆ پاراستنی لەش دەکرێ (وەک جووڵانەوەی ڕێک‌وپێک و نەرمی دەست، پێ، سەر و مل، نووشتانەوە و ڕاست بوونەوە).

▣ **ورزش کردن:** وەرزین؛ وەرزش‌کردن.

**ورزشکار** / varzeškār ، ـها؛ ـان/: *اسم.* وەرزشکار؛ لیزەڤان؛ وەرزشوان؛ یاریزان؛ ڕاهاتوو بە وەرزش.

**ورزشگاه** / varzešgāh ، ـها/: *اسم.* یاریگە؛ وەرزشگا؛ بینایەکی گشتی دەورگیراوی سەرباز بە سەکۆ و سەندەڵی لە پەراپەڕەوە بۆ دانیشتنی سەیرکەران و مەیدانی جۆراوجۆر لە ناوەندا.

**ورزشی** / varzešî/: *صفت.* وەرزشی؛ پێوەندیدار بە وەرزشەوە ‹مسابقەی ورزشی: کێبەرکێی وەرزشی›.

**ورزگار** / varzgār/: [از کردی] *اسم. [قدیمی]* وەرزیار؛ وەرزێڕ؛ جووتیار؛ جووتێر؛ جفتیار؛

جۆتیار؛ هیتیار؛ جووت‌بەندە.

**ـ ورزی** / varzî/: *پیوازه.* ـگێڕی؛ ـکەری؛ ـکاری؛ ڕەوتی بەڕێوە بردن؛ ئەنجامدان ‹کارورزی: کارگێری›.

**ورزیدگی** / varzîdegî ، ـها/: *اسم.* بارهاتوویی؛ ڕاهاتوویی؛ دۆخ یان چۆنیەتی کارامە بوون بە هۆی خو ڕاهێنانەوە ‹ورزیدگی خوبی داشت، مثل فرفره کار می‌کرد: ڕاهاتوویەکی باشی هەبوو، وەکوو فرفرە کاری دەکرد›.

**ورزیدن** / varzîdan/: *مصدر. متعدی.* // **ورزیدی:** کردت؛ **می‌ورزی:** دەکەی؛ **بورز:** بکە// کردن؛ بەجێ هێنان؛ بەڕێوە بردن؛ کار یان خۆ و خدەیەک بۆ ماوەیەکی زۆر درێژە پێدان ‹عشق ورزیدن: ئەویندای کردن›.

■ صفت فاعلی: **ورزنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **ورزیده** (کراو)/ مصدرمنفی: **نَورزیدن** (نەکردن)

**ورزیده** / varzîde/: *صفت.* بارهاتوو؛ ڕاهاتوو: ١. /ـها؛ ـگان/ کارامە؛ لێهاتوو؛ ژێهاتی؛ کارزان؛ کارا ‹کارگر ورزیده: کرێکاری کارامە› ٢. *[مجازی]* کرژ؛ گورج؛ بەهێز و توان ‹بدن ورزیده: لەشی بارهاتوو›.

**ورس** / vars/ ☜ **بَرس**

**ورساد** / versād ، ـها/: [روسی] *اسم. [چاپ]* وێرسات؛ کەرستەیەک وەکوو سینیەکی پچووک بۆ داچنینی دەستی پیتی چاپ کە بەرەکەی بە قەد دێڕەکان کەم و زۆر دەکرێ.

**ورشکست** / varšekast/: *صفت. [گفتاری]* تێشکاو؛ تێکشکاو؛ تەختە؛ وەرشکست؛ مایەپووچ؛ مایەپووت؛ مالکەتی؛ مافندی؛ مافنگی؛ دەملەپووش؛ شکسگەن؛ دارایی لە دەس چووگ.

⊡ ورشکست شدن: تێشکان؛ لێکەوتن؛ لێکەفتن؛ لە دەسەلات کەوتن؛ مال کەتن؛ دەملەپووش بوون؛ مایەپووچ بوون.

**ورشکستگی** / varšekastegî/: *اسم.* تێشکاوی؛ تێکشکاوی؛ لێکەوتوویی: ١. بار و دۆخی کەس یان دامەزراوەیێ کە سەرمایەکەی لە قەرزدا ڕۆشتبێ و هێشتاش قەرزار بێ ٢. *[مجازی]* بار و دۆخی بێ‌دەسەلات کەوتن و وەج نەمان ‹ورشکستگی سیاسی: تێشکاوی سیاسی›.

**ورشکسته** / varšekaste ، ـها؛ ـگان/: *صفت.* تێشکاو؛ لێکەوتوو؛ مالکەتی؛ لێکەوتە؛ لێکەفتگ؛ لێکەفتە؛ دەولەمەندی لێقەوماو ‹تاجر ورشکسته: بازرگانی لێکەوتوو›.

**ورشو** / :varšow, varšo/: [لهستانی] *اسم.* وەرشۆ؛ وەرشەو؛ ڤەرشە: ١. هەر ئالیاژێکی سپی بە ٤٦ تا ٦٣٪ مس، ٦ تا ٣٠٪ نیکل و ١٨ تا ٣٦٪ ڕۆح کە بۆ دروست‌کردنی سەماوەر، سینی، دەفر و ئامان و ئامرازی تیژ، کەلکی لێ وەردەگرن ٢. پارچە کانزای ئاوکاری‌کراو کە ماشینی پێ دەڕازێننەوە.

**ورشوی** / varšovî/: [لهستانی] *صفت.* وەرشۆیی؛ ڤەرشەیی؛ وەرشەوی؛ لە جنسی وەرشۆ یان تێکەلاو بە وەرشۆ ‹سینی ورشوی: سینی وەرشۆیی›: **ورشویی**

**ورشویی** / varšoyî/: [لهستانی] ☜ **ورشوی**

**ورطه** / varte/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ١. تەنگەژە؛ تەنگژە؛ تەنگەلان؛ چالێکی قوولی مەترسیدار وەکوو بیری ئاو ٢. گێژاو؛ گێژەن ٣. فەرتەنە؛ شوێنی دژوار و نالەبار و جێی مەترسی لە گیان.

**ورع** / vara'/: [عربی] *اسم. [ادبی]* خۆپارێزی؛ پارێزکاری؛ کار و ڕەوتی خۆ پاراستن لە کاری نارەوا.

**ورق** / varaq ، ـها/: [عربی] *اسم.* پەڕە؛ پەڕ؛ وەرەق؛ وەرەقە: ١. تەلش؛ گەلا؛ یەکەی ژماردنی کەل‌وپەلی تەخت و ناسک ‹یک ورق کاغذ: پەڕەیێ کاغەز› ٢. کاغەز؛ کاغەزی زۆرتر ٥٠×٣٠ بۆ چاپ ٣. /اوراق/ بەشێک لە دەفتەر، کتێب یان بلاقۆک کە لە دوو لاپەڕەی پشت و ڕوو پێک دێت ٤. پاسوور؛ وەرەق؛ گەنجەفە؛

پەنجاوچوار پەڕی درێژۆکەی نەخشارا لە مقەبا یان پلاستیک کە کایەی پێ دەکەن ٥. هەر کام لەو پەڕەیانە.

▣ **ورق برگشتن:** *[مجازی]* وەرەق هەڵگەڕانەوە/ هەڵگەڕیانەوە/ هەڵەوگەڕیان؛ بار گۆڕیان؛ ئاسا و هۆرگێلایەوە؛ ئاڵوگۆڕ بە سەردا هاتنی بار و دۆخ ‹وقتی کودتا شد و ورق برگشت، مجبور شد شبانه فرار کند: هەرکە کودەتا کرا و وەرەق هەڵگەڕایەوە، ناچار بوو بە شەودا ڕاکا›.

**ورق خوردن:** هەڵدرانەوە: ١. لاپەڕە درانەوە؛ گۆڕیانی لاپەڕە ‹صفحات کتاب از باد کولر ورق خورد: لاپەڕەی کتێبەکە بە هۆی بای کوولێرەوە هەڵدرایەوە› ٢. *[مجازی]* هەڵگەڕانەوە؛ بە سەر چوون؛ تێپەڕ بوون؛ ئاڵوگۆڕکردنی بار و دۆخ ‹صفحەی دیگری از تاریخ ورق خورد: بەرگێکی تری مێژوو هەڵدرایەوە›.

**ورق زدن:** ١. پەڕە/ لاپەڕە دانەوە؛ لاپەڕە هەڵدانەوە؛ پەڕە دان؛ وەرەق لێدان ٢. چاو پێدا خشاندن؛ بە سەردا چوون؛ ڕەمەکی خوێندن یان لێکۆڵینەوە ‹داشت کتابی را ورق می‌زد و به دنبال مطلبی می‌گشت: خەریک بوو چاوی بە کتێبێکدا دەخشاند و لە شوێن بابەتێ دەگەڕا›.

**ورق‌بازی** / varaqbāzî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* پاسووران؛ گەنجەفە؛ وەرەق‌بازی: ١. هەر کام لەو کایە جۆراوجۆرانە بە پاسوور دەکرێ ٢. کاری کایە کردن بە پاسوور. هەروەها: **وَرَق‌باز**

**ورق‌پاره** / varaqpāre ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* لەتەقاغەز؛ کوتەقاقەز: ١. تیکە قاغەزی بچووک ٢. *[مجازی]* بلاقۆک یان کتێبێکی بێبایەخ ٣. بەڵگەی کەم بایەخ ‹بعد از دوازده سال درس خواندن ورق‌پاره‌ای به دستم داده‌اند که به هیچ دردی نمی‌خورد: دوای دوازدە ساڵ خوێندن لەتەقاغەزێکیان دا بە دەستمەوە، کە بە کەڵکی هیچ نایە›.

**ورقلمبیدن** / varqolombîdan, -qolonbîdan/: *مصدر. لازم. [گفتاری]* // **ورقلمبیدی:** هەڵتۆقای؛ **ورمی قلمبی:** هەڵدەتۆقی؛ **ورِبقلمب:** هەڵتۆقە// هەڵتۆقان؛ هەڵتۆقیان؛ هەڵتۆقین؛ هەڵهاتن؛ هەڵماسین؛ هەڵمسان؛ ماسین؛ ماسیان؛ ماسەی؛ هەڵپفان؛ پەنەمان؛ پەنەمیان؛ باکردن ‹جیبش ورقلمبیده بود: گیرفانی هەڵتۆقیبوو›: **ورقلنبیدن**

■ صفت مفعولی: **ورقلمبیده** (هەڵتۆقیو)

**ورقلنبیدن** / varqolonbîdan/ ☜ **ورقلمبیدن**

**ورقه** / varaqe ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ١. پەڕ؛ پەڕە؛ گەڵا؛ وەرەقە ‹ورقەی کاغذ؛ ورقەی مقوا: پەڕی قاغەز؛ پەڕەی مقەبا› ٢. ☜ **برگ-٢**

▣ ورقه شدن: پەڕە- پەڕە بوون؛ گەڵا- گەڵا بوونەوە؛ وەک پەڕە لێ‌هاتن. هەروەها: **ورقه کردن**

**-ورقی** / varaqî/: [عربی] *پیوازە.* — وەرەقی؛ —پەڕەیی؛ پەیوەندیدار و سەر بە ئەندازەی وەرەق ‹نیم‌ورقی؛ دوورقی: نیم‌وەرەقی؛ دووبەرگی›.

**ورک** / varak/: *اسم. [گیاه‌شناسی]* گوڵەزەرد؛ زەنگوڵەگیا؛ بەرزەڵەنگ؛ بەرزەڵەنگ؛ دارچکێکی ڕازاوەیی لە تیرەی گوڵباخی بە گوڵی زەرد و لاسکی دڕکاوییەوە کە خۆڕسکە بەڵام دەشیچێنن.

**ورکشیدن** / varkešîdan/: *مصدر. متعدی. [گفتاری]* // **ورکشیدی:** هەڵتکێشا؛ **ورمی کشی:** هەڵدەکێشی؛ **وربکش:** هەڵکێشە// هەڵکێشان؛ هەڵکێشاندن؛ هۆرکێشتەی ‹پاشنه را ورکشید و راه افتاد: پاژنەکەی هەڵکێشا و کەوتەڕێ›.

■ صفت مفعولی: **ورکشیده** (هەڵکێشراو) / مصدر منفی: **ورنکشیدن** (هەڵنەکێشان)

**ورم** / varam، ـها؛ أورام/: [عربی]/*اسم. [پزشکی]* پەنەم؛ پەنام؛ ماس؛ پەرچڤ؛ وەرهەم؛ وەرەم؛ خانەبا؛ خانەما؛ پەشام؛ کیس؛ دیاردەی

هەڵماسین و ئەستوور بوونی ئەندام.

▣ **ورم مغزی:** مێشک‌پەنەمی؛ ئانسیفالیت؛ نەخۆشی ئاوسانی مێشک.

ورم ملتحمه: نەخۆشی ئاوسانی پێلووی چاو.

▣ **ورم کردن:** پەنەمان؛ پەنەمین؛ پەنەمیان؛ ئەوسان؛ ئاوسان؛ ماسان؛ ماسین؛ ماسەی؛ خڕ بوون؛ پەرچڤین؛ واکەردەی؛ هەڵپفان؛ هەڵماسیان؛ هەڵماسین؛ سوور هەڵگەڕان و ئەستوور بوونی برین یان شوێنێکی لەش ‹دست و پایش ورم کرده بود: دەس و پای پەنەمابوو›.

**ورمالیدن** / varmālîdan/: *مصدر. متعدی. لازم.* // **ورمالیدی:** هەڵتکرد؛ **ورمی‌مالی:** هەڵدەکەی؛ **وربمال:** هەڵکە // ☐ *متعدی.* ١. هەڵکردن؛ هەڵمالین؛ هەڵپێچان؛ قەمشتن؛ هەڵمالان؛ هۆرمالەی؛ لە خوارەوە بۆ سەر بە سەر یەکدا پێچان (زۆرتر بۆ قۆڵ و دەرلینگ) ☐ *لازم.* ٢. *[مجازی]* هەلاتن؛ دەرباز بوون؛ دەرچوون؛ بەرشیەی؛ پەکین.

■ صفت مفعولی: **ورمالیده** (هەڵکراو)

**ورم کرده** / varamkarde/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ئاوسا؛ ئاوساو؛ ئاوسیاگ؛ هەڵمساو؛ ئاوساگ؛ پەنەماو؛ ئاوپەڕ.

**ورموت** / vermût/: [فرانسوی] *اسم.* وەرمووت؛ جۆرە شەراوێکی شیرینە، دەگەڵ خواردنەوەی‌تر تێکەڵی دەکەن.

**ورمیشل** / vermîšel/: [فرانسوی] *اسم.* هەرشتە فەرەنگی؛ جۆرێک هەرشتەی باریکتر و کوڵتر لە ماکارۆنی.

**ورنچیدن** / varnačîdan/ ☜ **ورچیدن**

**ورنداشتن** / varnadāštan/ ☜ **ورداشتن**

**ورنرفتن** / varnaraftan/ ☜ **وررفتن**

**ورنکشیدن** / varnakešîdan/ ☜ **ورکشیدن**

**ورنی** / vernî/: [فرانسوی] *اسم.* لەعاب؛ ویڕنی؛ تراوێکی خەست و چەسپنی سروشتی یان دەسکردە کە بە سەر کەوش و کیف و...دا دەیساون، کە وشک بووەوە دەبێتە توژاڵێکی سفت و بریقەدار، بۆ جوانی و پاراستنی چەرم دەچێتە کار.

**ورنیامدن** / varnayāmadan/ ☜ **ورآمدن**

**ورنیفتادن** / varnayoftādan/ ☜ **ورافتادن**

**ورنیه** / vernîye، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* ورنیە؛ ئامرازێکی پێوانی مەودای زۆر کورت (کەمتر لە میلی‌میتر).

**وروجک** / vurûcak, vorûcak، ـها/: *صفت.* جرتی و فرتی؛ زیکل؛ هار و هاج؛ دانەسەکناو؛ ئەرەنەکاسیا؛ گوێزی ناو بێژنگ؛ تایبەتمەندی منداڵێ کە بە دەست و پاوە ناوەستێ.

**ورود** / vorûd, vurûd/: [عربی] *اسم.* ١. کاری چوونە ژوورەوە؛ چوونە ناو؛ لەوای دڵێ ٢. دەسپێک؛ کار و ڕەوتی دەسپێکردنی بابەتێک ٣. دەرگانە؛ زارک.

**ورودی**[1] / vorûdî, vurûdî، ـها/: [عربی] *اسم.* دەرگانە: ١. دراوێ کە بۆ چوونە شوێنێک دەبێ بدرێ: **ورودیه** ٢. مەیدان و بۆشایێ کە بۆ چوونە ژوور، بەوێدا تێدەپەڕن ‹ورودی ساختمان: دەرگانەی خانووبەرە›.

**ورودی**[2]: *صفت.* چوونە ژوور(ەوە)؛ چوونە ناو ‹در ورودی؛ آزمون ورودی: دەرگای چوونە ژوور؛ ئەزموونی چوونە ناو›.

**ورودیه** / vorûdîyye, vurûdîyye/: [عربی] ☜ **ورودی**[1]ـ**١**

**وروره** / ververe/: *اسم. [قدیمی]* جەلجەلوت؛ پرتەپرتی بن‌لێوانی جادووگەر.

**ورید** / varîd، ـها/: [عربی] *اسم. [کالبدشناسی]* سیارەگ؛ ڕەشەدەمار؛ سیاوەرگ؛ ئەو ڕەگەی خوێن دەگەڕێنێتەوە بۆ دڵ.

▣ **ورید اجوف:** ڕەشەدەماری گەورە.

ورید اجوف اسفل: بزرگ سیاهرگ زیرین ☜ **بزرگ سیاهرگ**

**ورید اجوف اعلا**: بـزرگ سـیاهرگ زبـرین ☜ **بزرگ سیاهرگ**

**وریسـم** / verîsm/: [فرانسوی]/اسم. ڤریسـم؛ شێوازێکی هونەری کە وازی لە بابەتی ئاسایی و ڕۆژانەیـە و خـۆی لـە ئوسـتووره و دیرۆکـان دەبوێرێ.

**وز** / vez/: صفت. گـژ؛ گـرژ؛ درژ؛ کـرژ؛ بـژ: ١. شێواوی و پفکردوویی مووی سەر، بەتایبەت لە کەش و هەوای نمداردا ‹باد و باران زده بود و موهایش وز کرده بود: با و باران لێیدابوو، قـژی گـژ کردبـوو› ٢. لـوول؛ بـە چـینچـینی ورد و لێکهالاوەوە (وەک مووی ڕەشپێستان).

▣ وز کـردن: گـژ بـوون؛ قژکـردن؛ دەژیـەی؛ گژگژین؛ شپرز بوون و پفکردنی مووی سەر: **وزکرده**

**وزارت** / vezārat/: [معـرب از پهلـوی]/اسـم. وەزارەت: ١. وەزیـری؛ شـالیاری؛ کـار و پلـەی وەزیر ٢. وەزارەتخانـە ‹وزارت صنایع: وەزارەتـی پیشەسازی›.

**وزارتخانه** / vezāratxāne، ـها/: [معـرب/ فارسی] /اسم. وەزارەتخانە: ١. دامەزراوەیـەکی دەوڵـەتی کە لە ژێر چاودێری وەزیرێکـدا بـەڕێوە دەچـێ ٢. یانەی ناوەندی ئەو دامەزراوەیە کـە شـوێنی کاری وەزیره.

**وزارتـی** / vezāratî/: [معـرب] صفت. وەزارەتی؛ سەر بە وەزارەت ‹مقام وزارتی: پێگەی وەزارەتی›.

**وزان** / vazān/: قید. شنەشن؛ بە شـنیانەوە؛ بـە شنینەوە؛ بە هەڵکرد؛ بە شنەشن.

**وزاندن** / vazāndan/: مصدر. متعدی. // **وزانـدی**: هەڵـتکرد؛ **میوزانی**: هەڵـدەکەی؛ **بـوزان**: هەڵـکە// هەڵـکردن؛ هۆرکـەردەی؛ بزوانـدن؛ هەژانـدن: **وزانیدن**

■ صفت فاعلی: **وزاننده** (هەڵـکەر)/ صـفت مفعـولی: **وزانده** (هەڵکراو)

**وزانیدن** / vazānîdan/ ☜ **وزاندن**

**وزر** / vezr/: [عربی]/اسم. [ادبی] ١. گوناه ؛ گونـا؛ پیـازە؛ بـەزە؛ هـارس؛ تـاوان؛ سـووچ؛ گوناسـە؛ گوناسا ٢. باری گران.

**وزرا** / vozarā/: [عربی] جمعِ ☜ **وزیر**

**وزش** / vazeš، ـهـا/: اسـم. شـنـە؛ ڕەوتی هەڵکردن؛ شنیان ‹وزش نسیم: شنەی سروە›.

**وزغ** / vazaq، ـها/: اسم. ترتـرە؛ گیانـدارێکی دووژی بۆقئاسایە بە لەشی قەڵەو، پای کورت و زۆرێک لووی لکـلک وەکوو بـالووک لـە سـەر پێستەوە: **وزق**

**وزق** / vazaq/ ☜ **وزغ**

**وزکرده** / vezkarde/ ☜ وز کردن، **وز**

**وزن** / vazn، ـها؛ اوزان/: [عربـی]/اسم. ١. کـێش؛ قورسایی؛ سەنگ؛ سـەنگینی؛ گـرانی؛ گرانـایی: *الف)* قورسی ‹ وزن آن سنگ چقدر است؟: قورسایی ئەو بەردە چەندە؟› *ب)* ئەندازەی قورسی بە پێـی یەکەی سـتاندارد ‹وزن آن بیش از ٢٠٠ کیلو بـود: گرانایییەکەی زۆرتر لە ٢٠٠ کیلۆ بوو› *ج)* پێومانێک بۆ ڕیزکردنی بەشدارانی برێ کێبەرکێ وەرزشی (وەک زۆرەبانی، مشتێن و...) ٢. *[مجازی]* بایـەخ؛ قیمەت ‹حرف او پیش مردم وزنی ندارد: قسەی بەلای خەڵـکەوە بایـەخێکی نیـە› ٣. هەڤـدەن؛ ڕەوت؛ کێشـی شـێعر؛ ژمـارەی برگـە لـە شـێعرێکدا ٤. کێش؛ کێشانە؛ کێشی وشە؛ ئاهەنگی هاتنـە سـەر زاری وشـە، لـە بـواری ژمـارەی برگـە و بزاڤەکانیەوە ‹کبیسه بر وزن همیشه: کەبیسە لە سەر کێشی هەمیشـە› ٥. *[موسـیقی]* ڕیـتم؛ کێشی مووسیقا.

▣ وزن اتمی: کێشی ئەتومی؛ ژمـارەی جرمـی؛ نێوانەی جرمی ئەتۆمی توخمێـک لـە ئاسـت $\frac{1}{12}$ جرمی کەربونی ١٢.

وزن شـعر: کێشـی شـیعر؛ ڕەوت؛ هەڤـدەن؛ ڕەوتی هەڵبەست؛ چۆناوچۆنی چنینی وشەی هەر باڵێک لە بواری ئاهەنگی خوێندنەوەیانەوە.

وزن ضربی: *[موسیقی]* کێشی زەربی؛ کێشێکی

مووسیقایی له ئاهەنگێکدا، که له سەرەتاوه تـا برانەوه هەر دووپاته دەبێتـەوه (وەک ئاهـەنگی هەڵپەڕکێ یان مارش).

**وزن عروضی:** کێشی عەرووزی؛ کێشی شیعر به گوێرەی بنەمای زانستی عـەرووز و ڕیـزی ئەفاعیل.

**وزن مخصوص:** */فیزیک/* کێشـانەی تایبـەت؛ قورسی یەکەیێک له بارستایی بۆ هـەر شـتێ (وەک دەڵێن کێشانەی تایبەتی ئاو دەکاته یەک، یانێ قورسـی سـانتیمیتریکـی چوارپاڵـووی ئـاو، یەک گرەمه).

**وزن ملکـولی:** */شـیمی/* کێشـانەی مولکـوولی؛ کێشی مولکوول گرەمێـک ($6{,}02 \times 10^{23}$ دانـه) له هەر ماکێ.

**وزن هجایی:** کێشی بڕگەیی؛ کێشی شێعر بـه پێی یەکسانی یان هاوڕێژەیی بڕگەکانی هـەر باڵێک.

▣ **وزن کـــــردن:** کێشـــــان؛ کێشـــــاندن؛ هەڵســـەنگاندن؛ هەڵســـەنگانن؛ کەرانـــدش؛ کێشانەکردن؛ کێشانەکەردەی؛ دیاریکـردنی قورسایی شتێک به پێی یەکەیەکی دیاریکراو ‹بچـه را وزن کردنـد، ۴،۵ کیلـو بـود: منداڵـەکەیان کێشـا، ٤،٥ کیلۆ بوو›. هەروەها: **وزن شدن**

**وزنه** / vazne ، ـها؛ اوزان/: [عربی]*/اسم.* ١. سـەنگ؛ کێشانه؛ کوتێک له بەرد یا کانزا به قورساییەکی دیـاریکراوەوه بـۆ دەسنیشـانکـردنی کێشـی کەلوپەل ٢. سەنگ؛ کوته کانزایەکی قورس که دەزگا و ماشینی پێ هاوسەنگ دەکەن (وەک له ئاسانسۆردا) ٣. وەزنه؛ هاڵـتیر؛ پارچـەکانزای بـه بیچمـــی جۆراوجـــۆرەوه بـــۆ وەرزش ‹وزنــه را یک‌ضرب بلند کرد: هاڵـتیرەکەی یـەکتـەکان بـەرز کردەوه› ٤. وەج؛ ڕێز؛ حورمەت ‹وزنـەی سیاسـی: وەجی ڕامیاری›.

**وزنـه‌بـردار** / vaznebardār ، ـها؛ ـان/: [عربـی/ فارسی]*/اسم.* وەزنەهەڵگر؛ وەرزشکارێ که هاڵتەر هەڵدەگرێ.

**وزنه‌بـرداری** / vaznebardārî/: [عربـی/ فارسـی] */اسم.* وەزنەهەڵگری؛ وەرزشێکی تاکەکەسـی بـه شێوەی هەڵگرتن و بەرزکردنـەوەی مێڵـەیەکی دوو سەر سەنگ (هاڵتیر) تا بانی سەر.

**وز-وز** / vezvez/: *صـوت.* جیزەجیـز؛ ویزەویـز؛ وزەوز؛ گیزەگیـز؛ ڤزەڤـز؛ دەنگـی زۆر بـاریکی مێش و میشووله یان هەر دەنگێکی وا.

▣ **وز- وز کـردن:** جیزەجیز/ ویزەویز/ وزەوز/ کردن؛ ویزاندن؛ وزەکردن؛ ویزنەی؛ ویزنای.

**وزـــوزی** / vezvezî/: *صـفت.* گژگـژی؛ گژنـه؛ گژگژاویلکه؛ گژکـردوو؛ پـفکـردوو؛ بـه سـەر و سەکوتێکی شپرز و ئاڵۆزاوەوه.

**وزیــــدن** / vazîdan/: *مصـــدر. لازم.* // **وزیـــدی:** شنیای؛ **مـیوزی:** دەشـنی؛ **بـوز:** بشـنه // شـنین؛ شنیان؛ شنان؛ شهین؛ هەڵکردن؛ وەزان؛ وەزین ‹باد آرامی وزیـد: بایـەکی نـەرم شـنیا›. هـەروەها: **وزیدنی**

■ صفت فاعلی: **وزنده** (ـ)/ صفت مفعولی: **وزیـده** (شنیاگ)/ مصدر منفی: **نوزیدن** (نەشنیان)

**وزیـر** / vazîr/: [معـرب از پهلـوی]*/اسـم.* وەزیـر؛ شـاریار؛ شـالیار: ١. /ـهـا؛ ـان؛ وُزَرا/ بەرپرسـی وەزارتخانـــه و ئەنـــدامی کابینـــەی دەوڵـــەت ٢. مۆرەیەکی شەترەنج که له هـەموو لایەکـەوه دەتوانێ ببزوێ و هەر یاریکەرێک یەکێکی هەیه ٣. بەردەسی شا له هێندێ گەمەدا.

▣ **وزیـر مختـار:** باڵـوێز؛ باڵـیۆز؛ ڕاسـپاردەی ڕامیـاری دانیشـتوو لـه ناوەنـدی وڵاتێکـی هەندەراندا.

**وزیـر مشـاور:** وەزیـری ڕاوێژکـار؛ ڕاوێژکـاری سەرۆکوەزیر یان کۆڕی وەزیران.

**وزیـری** / vazîrî/: [معـرب]*/اسـم.* ١. وەزیـری؛ شالیاری؛ کاری وەزیـر ‹روسـتازادگان دانشـمند، بـه وزیری پادشا رفتند: لادێیی ژیر و زانا، چوون بۆ وەزیری پاشا› ٢. ☜ قطع وزیری، **قطع**

**وزین / vazîn/**: [عربی] *صفت.* سەنگین؛ گران: ١. *[مجازی]* گرانمایە ‹شخصیت وزین: کەسایەتی سەنگین› ٢. *[ادبی]* قورس؛ بەکێش ‹جسم وزین: تەنی قورس›.

**وسائط / vasā'et/**: [عربی] ☜ **وسایط**

**وسائل / vasā'el/**: [عربی] ☜ **وسایل**

**وساطت / vesātat, vasātat** ، ـها/: [عربی] *اسم.* ناوبژی؛ نێوبژی؛ نێوان گری؛ ناوجیکەری؛ ناوجیگەری؛ ناوبژیکەری؛ ناوجیەکەری؛ نێوبژێری؛ مانجیگەری؛ نێوانجیگەری ‹همسایەها وساطت کردند و دعوا تمام شد: هاوسێکان ناوبژیان کرد و شەڕ تەواو بوو›.

**وسایط / vasāyet/**: [عربی] جمعِ ☜ **واسطە: وسائط**

◙ **وسایط نقلیە**: کەرەسەی گواستنەوە؛ ئامرازی پێڕاگوێز.

**وسایل / vasāyel/**: [عربی] جمعِ ☜ **وسیلە: وسائل**

◙ **وسایل نقلیە** ☜ وسیلەی نقلیە، **وسیلە**

**وسط** [1] **/ vasat** ، ـها/: [عربی] *اسم.* نێوان؛ ناوەند؛ نێوەند؛ ناوە؛ ناوەڕاست؛ نێوەڕاست؛ ناوڕاس؛ نێوەڕاس؛ ناوەڕاس؛ نخس؛ پونگاڵ؛ شەق؛ دل؛ دڵیڕاسە؛ ناوقەد؛ هاویر؛ چەق؛ ناف؛ نێوجەرگە؛ ناوجەرگە؛ نێوەند؛ کونەڵە؛ دوڕ؛ نێرەک؛ نیڤی؛ نیڤ؛ ئۆرت؛ داگ؛ گرە؛ ناڤی؛ ناڤەند؛ نابەین؛ مینە؛ مینجە؛ مینجا؛ ناڤبەند؛ وەرتە؛ وەرت ‹وسط حیاط؛ وسط جمعیت؛ وسط سیب: نیوانی حەوشە؛ ناوەڕاستی جەماوەر؛ ناوەندی سێو›.

◙ **وسط را گرفتن**: *[گفتاری]* ناوبژی کردن؛ ناوجی کردن؛ نێوبژی کردن ‹آرام وسط را گرفت و نگذاشت کار بالا بگیرد: ئارام ناوبژی کرد و نەیهێشت شەڕ داگیرسێ›.

**وسط** [2]: *صفت.* ناوەندی؛ ناونجی: ١. ناوەڕاست؛ ناوڕاس؛ میانێن؛ ناڤگین؛ نابەین؛ ناوگین؛ دڵیڕاسەین؛ ناوەڕاستین؛ ناوەڕاسن؛ لە نێوان دوو یان چەن شتدا ‹اتاق وسط؛ در وسط: دیوی ناوەڕاست؛ درگای ناوگین› ٢. *[گفتاری]* مامناوەنجی؛ مامناوەندی؛ نە چاک نە خراپ ‹جنس وسط: جنسی ناونجی›.

**وسط** [3]: *قید. [گفتاری]* ناوەڕاست؛ نێوانەوە؛ ناوەڕاس؛ نێوەڕاست؛ لە ناو ڕاستدا؛ لە نێواندا؛ نێوان ‹وسط افتادن؛ وسط گذاشتن: کەوتنە ناوەڕاسەوە؛ نانە نێوانەوە›.

◙ **وسط افتادن**: *[گفتاری]* کەوتنە نێوانەوە/ ناوەوە: ١. خۆ خستنە ناو؛ خۆ دەکارێکەوە تێوەردان ‹پدرم افتاد وسط و از همسایەها پول جمع کرد: باوکم کەوتە نێوانەوە و لە هاوساکان پارەی کۆ کردەوە› ٢. کەوتنە نێوان؛ کەوتنە بەین؛ کەوتنە مابەینی کەسانیتر ‹توی ماشین، من وسط دو تا آدم چاق افتادە بودم: لە نێو ماشیندا، کەوتبوومە نێوان دوو مرۆی قەڵەوەوە›.

وسط کشیدن: هێنانە پێشەوە؛ هاوردنە بەرەوە؛ ئاردەینە بەین ‹حرف پول را وسط کشیدن: قسەی پارە هێنانە پێش›: **بە وسط کشیدن**

**وسط گذاشتن**: *[گفتاری]* هێنانە پێشەوە؛ هاوردنە بەرەوە؛ ڕۆکردن؛ کردنە ناوەڕاست؛ ئەنەوەردەس نیەی ‹هرچە داشتیم گذاشتیم وسط: هەر شتێکمان هەبوو هێنامانە پێشەوە›.

**بە وسط کشیدن** ☜ **وسط کشیدن**

**وسط / vasate/**: [عربی] *حرف.* نێو؛ ناو؛ ناوەڕاسی؛ ناوەڕاستی؛ نێوەڕاستی؛ دڵی ڕاسەو ‹وسط حیاط؛ وسط مردم: نیو حەوش؛ نیو خەڵک›.

◙ **وسط حرف کسی دویدن** ☜ توی حرف کسی دویدن، **تو** [2]

**وسط دعوا نرخ طی/ تعیین کردن**: لە ناو وتوویژێکدا، قسەی خۆ وەک شتێکی براوە دەربڕین.

**وسطی** [1] **/ vasatî** ، ـها/: [عربی] *صفت.* ناوەندی؛ ناوەنجی؛ ناوەڕاس؛ ناوەڕاست؛ ناوەڕاسن؛ دڵیڕاسین؛ دڵیڕاسینە ‹انگشت وسطی: قامکی

ناوەندی›.

**وسطی** [٢]: ضمیر. ناوەڕاست؛ ناوەندی؛ ناوەنجی؛ ناوەڕاس؛ ناوەڕاسین؛ دڵیڕاسین؛ دڵیڕاسینە؛ کەسێک یان شتێ کەوتبێتە ناوەڕاستەوە ‹وسطی مال من است: ناوەڕاستیەکە هی منە›.

**وسطی / vostā/**: [عربی] صفت. ناوین؛ ناڤین؛ ناوەندی؛ ناوەڕاست؛ دڵیڕاسین ‹آسیای وسطی؛ قرون وسطی: ئاسیای ناوین؛ سەدەگەلی ناوەندی›.

**وسع / vos'/**: [عربی] اسم. دەسڕۆیی؛ دەسچوویی؛ توانایی؛ توانایی ماڵی ‹وسع من نمی‌رسد لباس تازه بخرم: دەستم نارواَ جلی نوێ بکرم›.

**وسعت / vos'at/**: [عربی] اسم. ١. پانتایی؛ بەرینی؛ بەرینایی؛ بەربڵاوی ‹وسعت این باغ چقدر است؟: پانتایی ئەم باخە چەندە؟› ٢. پانایی؛ پێچەوانەی درێژایی ‹وسعت این خیابان ٣٠ متر است: پانایی ئەم شەقامە ٣٠ میترە› ٣. زۆری؛ فرەیی؛ فراوانی؛ زەحفی.

**وسمه / vasme** ، ـها/: [عربی] اسم. وەسمە؛ وسمە؛ وزمە؛ خم؛ خوم؛ تەتەران: ١. گیایەکی ئالیکی دووساڵانە بە گوڵی زەرد و بەری توورەکەییەوە کە گەڵاکەی ماکی ڕەنگی تێدایە ٢. خەتات؛ خەنەوڕەنگ؛ ڕەنگی نێو گەڵای ئەو گیایە کە لە برۆی دەدەن.

**وسنی / vasnî** ، ـها/: اسم. *[قدیمی]* وەسنی؛ هەوێ؛ هەڤی؛ هەنە؛ هەوی؛ هەوو؛ هەوە.

**وسواس / vasvās** ، ـها/: [عربی] اسم. وەسواس: ١. *[روان‌شناسی]* ڕا‌ـڕا؛ واز‌ـواز؛ بیر و هەستێکی تێکەڵ بە شک و دڕدۆنگی بەتایبەت لەمەڕ پاکی و ناپاکی و دڵنیا نەبوون لە سەر خاوێن‌بوونەوەی هەموو شتێک ٢. *[مجازی]* وردی، وردبینی و شوێنگیری زۆر و لەڕادەبەدەر ٣. شک؛ دوودڵی؛ دڕدۆنگی.

**وسواسی / vasvāsî** ، ـها/: [عربی] صفت. *[روان‌شناسی]* ڕاـڕایی؛ وازـوازی؛ وەسواسی؛ هووک؛ بەبێ توانستی بڕیار دان و دڵنیا بوون ‹با آدم وسواسی در افتادن مشکل است: ئاوقای مرۆی ڕاـڕایی بوون دژوارە›.

**وسوسه / vasvase** ، ـها/: [عربی] اسم. وەسوەسە؛ بیر یان هەستێک کە لە پەستا مرۆ بۆ کردنی کارێک هان دەدا.

◘ وسوسه شدن: کەوتنە وەسوەسە. هەروەها: **وسوسه کردن**

به وسوسه افتادن: تووشی وەسوەسە بوون.

هەروەها: **به وسوسه انداختن**

**وسیع / vasî'/**: [عربی] صفت. هەراو؛ هیرا: ١. فرەوان؛ پان و بەرین؛ بەربڵاو؛ بەرفراوان؛ بەرفرەوان ‹دشت وسیع؛ کشور وسیع: دەشتی هەراو؛ وڵاتی هیرا› ٢. گەورە؛ گوشا؛ بڵاو؛ پان؛ ئاوەڵا؛ پان‌وپۆڕ ‹سوراخ را قدری وسیع کردیم: کونەکەمان نەختێ هەراو کردەوە› ٣. بەربڵاو؛ هەمەلایەنە؛ هەمەلایەن ‹مطالعەی وسیع: لێکۆڵینەوەی بەربڵاو›.

**وسیله / vasîle**، ـها؛ وسایل/: [عربی] اسم. ١. ئەسپاپ؛ ئامێر؛ ئامراز؛ کەرەسە؛ کەرەستە؛ ئەوەی بۆ بەڕێوە بردنی کار یان گەیشتن بە ئامانجێک پێویستە ‹وسیلەی نقلیە: کەرستەی گواستنەوە› ٢. هۆ؛ سۆنگە؛ نێوانگر و کارڕێکخەر ‹او وسیلەی آشنایی ما شد: ئەو بووە هۆی ئاشنا بوونمان›.

◘ وسیلەی ارتباط جمعی: ☜ ڕسانەی گروهی/ همگانی/ جمعی، **رسانه**

وسیلەی تفریح: هەوی؛ کەرستەی خۆ خلافاندن و ڕابواردن.

وسیلەی نقلیه: ئامرازی پێراگوێز؛ کەرەسەی گواستنەوە.

**وش** [١] **/ vaš/**: اسم. گودە؛ قوزلاخ؛ قۆزلاخە؛ حەپی؛ کەلووی پەمۆ؛ قۆزاخەی پەمۆ؛ پەمووی خاو.

**ـ وش** [٢]: پسوند. ـ ئاسا؛ ـ سا؛ ـ وەش؛ ـ واش؛ ـ واژ؛ ـ بەش؛ شێوەـ؛ وەکوو؛ وێنە ‹پریوش: پەری‌ئاسا›.

**وشا** / vašā/: اسم. به‌هه‌ک؛ جه‌وگه‌به‌هه‌ک؛ شیله‌ی گیای به‌هه‌ک.

**وشتن** / vaštan/: مصدر. لازم. [قدیمی] هه‌ڵپه‌ڕین؛ هه‌ڵپه‌ڕان؛ له‌یزتن؛ له‌یستن؛ له‌هستین؛ لیزین؛ وازین؛ ڕه‌خسین؛ سه‌ما کردن؛ هۆرپه‌ڕه‌ی؛ هۆرپڕای؛ هه‌ڵپه‌ڕکێ کردن.

**وشق** / vašaq ، ـها/: [ترکی]/اسم. [قدیمی] گه‌ره‌ویلک؛ وشه‌گ؛ ورشه‌ک؛ گوێ‌ڕه‌ش؛ هه‌نگوین‌خۆره؛ جانه‌وه‌رێکه له تیره‌ی پشیله به کلکی کورت، تووکی نه‌رم و پڕ و شتێکی وه‌ک کاکۆل به سه‌ر هه‌ر دوو گوێوه، بۆ که‌وڵه‌که‌ی ڕاوی ده‌که‌ن: **وَشَک**

**وشک** / vašak/: [از ترکی] ☜ **وَشَق**

**وصال** / vesāl/: [عربی]/اسم. ۱. ڕه‌وتی پێک‌گه‌یشتن؛ پێک‌گه‌یین؛ به یه‌ک گه‌یشتن؛ گه‌یشتن به دڵدار و ده‌سته‌وملان بوونی ۲. ده‌سکه‌وتن؛ ده‌ست پێگه‌یشتن؛ گه‌یشتن به شتێک و بوونه خاوه‌نی.

**وصایا** / vasāyā/: [عربی] جمعِ ☜ **وصیت**

**وصایت** / vesāyat/: [عربی]/اسم. ڕاسپارده‌یی: ۱. کار و پیشه‌ی ڕاسپارده ۲. کارێک که به پێی ئه‌وه که‌سێ، که‌س یان که‌سانێکی‌تر ڕاسپێرێ دوای مه‌رگی شتێ بکه‌ن.

**وصف** / vasf، ـها؛ اوصاف/: [عربی]/اسم. ڕاوه؛ ڕاژ؛ ڕاڤه؛ وتنه‌وه‌ی چۆنیه‌تی شت، که‌س یان ڕووداوێک وه‌ها که وێنه‌یه‌ک له‌و بهێنێته به‌رچاو.

**وصف‌ناپذیر** / vasfnāpazîr/: [عربی/ فارسی] صفت. له گوتن نه‌هاتوو؛ له وتن نه‌هاتگ ‹شادی وصف‌ناپذیر: خۆشیه‌کی له گوتن نه‌هاتوو›.

**وصفی** / vasfî/: [عربی] صفت. ڕاوه‌یی؛ ڕاڤه‌یی؛ ڕاژه‌یی.

**وصل** / vasl/: [عربی]/اسم. ۱. کار و ڕه‌وتی لێدان؛ لکاندن؛ لکنه‌ی؛ جووش‌داین ‹دوشاخه را به پریز وصل کرد: دو شاخه‌که‌ی دا له پریز› ۲. پێک‌گه‌یشتن؛ به یه‌ک گه‌یشتن ‹شب وصال: شه‌وی پێک‌گه‌یشتن›.

**وصلت** / vaslat ، ـها/: [عربی]/اسم. خزمایه‌تی؛ لف‌بژێری؛ پێوه‌ندی، به‌تایبه‌ت به هۆی ژن و ژنخوازه‌وه ‹این نتیجه‌ی وصلت با شما بود: ئه‌مه ئاکامی خزمایه‌تی له‌گه‌ڵ ئێوه بوو›.

▣ وصلت دادن: ده‌ست دان؛ ده‌سکه‌وتن؛ به ده‌س هاتن ‹پولی که می‌خواهی این ماه وصلت نمی‌دهد: ئه‌و پاره ده‌ته‌هه‌وێ ئه‌م مانگه ده‌ست نادا›.

وصلت کردن: خزمایه‌تی‌کردن؛ ژن و ژنخوازی کردن؛ دابین‌کردنی پێوه‌ندی بنه‌ماڵه‌یی.

**وصله** / vasle ، ـها/: [عربی]/اسم. ۱. پینه؛ دۆن؛ پسپان؛ پنج؛ ڕینگوڵ؛ بزگوڕ؛ تیتۆڵ؛ پاتک؛ پاخ؛ ڕیت؛ پارچه‌ی له قوماش، چه‌رم یان کانزای به سه‌ر کون، دڕاو یان سواودا گیراو ۲. که‌ژنه؛ پارچه‌پینه؛ پاتک؛ په‌ڕۆ؛ له‌ته چه‌رم یان په‌ڕۆیێ که بۆ جوانی یاخۆ بۆ به‌رگری له دڕان به چۆک و ئه‌نیشکی جل‌وبه‌رگیدا ده‌دوورن ۳. [مجازی] بوختان؛ بوختیان ‹به او وصله‌ی دزدی زدند و به زندانش انداختند: بوختانی دزییان لێدا و له زیندانیان کرد›.

▣ وصله‌ی تن: [مجازی] به‌ندی/ به‌نن دڵ؛ به‌ندی هه‌ناو؛ هێزی هه‌ناو؛ جگه‌رگۆشه؛ بۆ ده‌ربڕینی خۆشه‌ویستی به منداڵ ده‌گوترێ ‹آرام وصله‌ی تنم بود، چطور می‌توانستم ولش کنم؟: ئارام به‌ندی دڵم بوو، چۆن ده‌متوانی ده‌ستێ لێ به‌رده‌م؟›.

وصله‌ی ناجور: ۱. پینه‌ی ناتاو/ ناپۆڕ؛ پینه‌یه‌کی دوو ڕه‌نگ ۲. [مجازی] دۆستی ناباب؛ ئاواڵی خراپ.

▣ وصله انداختن/ زدن/ کردن: پینه کردن/ لێدان/ کوتاندن؛ په‌ره‌سپاندن؛ په‌ره‌سپان؛ پسپان‌کردن؛ پینه و په‌ڕۆکردن/ که‌رده‌ی ‹شلوارش را وصله زده بود: شه‌رواڵه‌که‌ی پینه کردبوو›.

**وصله ای** / vasle'î/: [عربی] صفت. پینه‌وپه‌ڕۆکراو؛

پینەدار؛ بەتیتۆڵ؛ بـەبزگور ‹یک شلوار وصلەدار تنش بود: پاتۆڵێکی پینەوپەڕۆکراوی لە پێدا بوو›.

**وصـلـەدار / vasledār/:** [عربـی/ فارسـی] *صفت.* پینـەکراو؛ بـەتیتۆڵ؛ بـەبزگور؛ پینەوپـەڕۆکراو ‹لباس وصلەدار: جلی پینەکراو›.

**وصول / vusûl, vosûl/:** [عربی]/*اسم.* کار و ڕەوتی گرتن؛ وەرگرتن؛ ساندن؛ سەندن؛ گورەتەنە.

▣ وصول شـدن: وەرگـیران ‹طلبت وصول شد: قەرزەکەت وەرگیرا›. هەروەها: **وصول کردن**

**وصـولی / vusûlî, vosûlî ، ـها/:** [عربـی] *صفت.* وەرگیراو: ١. سەنراو؛ سـاندراو؛ سـەندراو ‹مبلغ وصولی به حساب بانکی شما واریز شد: پارەی وەرگیراو خرایـە نێـو حیسـابی بانکیتانـەوە› ٢. شـیاوی وەرگرتن ‹برات وصولی: بەراتی وەرگیراو›.

**وصـی / vasî ، اوصـیا/:** [عربـی]/*اسـم.* قـەویت؛ سەروەسـیەت؛ سـەرەوگرد؛ ڕاسـپاردەی وەسیەت‌کەر بۆ بەڕێوە بردنی وەسیەت.

**وصـیت / vasîyyat ، ـها؛ وصایا/:** [عربـی]/*اسـم.* وەسیەت؛ قـەویتی؛ قـەوینتی؛ وەلی: ١. کـاری ڕاسـپاردن بـە کـەس یـان کەسـانێ کـە پـاش مەرگی ڕاسپێر بە کـار و بـاری ڕابگـەن ‹وصیت کرده بوده خانه را بدهند به دخترش: وەسیەتی کردبوو خانووەکە بدەن بە کچەکەی› ٢. ئەو شـتەی کـە بەم جۆرە ڕاسپێردراوە ‹به وصیت او عمل کردنـد: وەسیەتەکەیان بـەڕێوە بـرد› ٣. ئامۆژگـاری؛ ئامۆژیاری؛ پەند ‹از من به تو وصیت، از این‌جور آدم‌ها دوری کن!: لە منەوە بۆ تۆ وەسیەت بێ، توخنی ئـەم جۆرە کەسانە نەکەوی!›.

**وصـیت‌نامـه / vasîyyatnāme ، ـهـا/:** [عربـی/ فارسی]/*اسم.* وەسیەت‌نامە؛ ڕاسپێری و قـەوینتی بە نووسراوی ‹در وصیت‌نامه هم ذکر شده بـود: لـە وەسیەت‌نامەکەشدا ناوی لێ برابوو›.

**وضـع / vaz' ، ـها؛ اوضاع/:** [عربـی]/*اسـم.* ١. بـار؛ مەرە؛ حاڵ؛ چلۆنایەتی؛ دۆن؛ دارەت؛ لـۆر؛ دەق؛ مەڕەو؛ دۆخ؛ چۆنیـەتی ‹وضع مالی او بـد است و وضع روحی‌اش هم از آن بـدتر: باری ماڵـی خراپـە و باری ڕۆحیشی لەو خراتر› ٢. کاری دانان؛ دانیان؛ هێنانـە ئـاراوە ‹مجلس قـانون تـازه‌ای وضع کـرد: ئەنجومەن قانوونێکی تازەی دانا›.

▣ وضـع حمـل: ڕەوتی زایـین؛ زان؛ زای؛ بـار دانان؛ مناڵ هاوردن.

**وضعی / vaz'î/:** [عربی] *صفت.* ١. دانراو؛ دانـدراو؛ دانریـاگ ٢. جێگـەیی؛ شـوێنی ‹حرکت وضعی: بزاوی جێگەیی›.

**وضـعیت / vaz'îyyat/:** [عربـی]/*اسـم.* بـار و دۆخ؛ دارەت؛ چلۆنایەتی؛ چۆنیەتی؛ چلۆنایەتی حاڵ و هەواڵ ‹وضعیت آن‌جا را برایم بنـویس: بـار و دۆخـی ئەوێم بۆ بنووسە›.

**وضـو / vuzû, vozû/:** [عربـی]/*اسـم.* دەسـنوێژ؛ دەسـتنوێژ؛ دەسـنمێژ؛ دەسمێـژ؛ دەسـنۆژ؛ دەسمێ؛ دەسـنماز؛ ئـایینی تایبـەتی شـۆردنی سەرو دەست پێ و خـۆ خـاوێن‌کردنـەوە پـێش دابەستنی نوێژ.

▣ وضو گرفتن: دەسنوێژگرتن/ شتن؛ دەس‌ودیم گێرتەی.

**وضـوح / vuzûh, vozûh/:** [عربـی]/*اسـم.* ڕوونی؛ ئاشکرایی؛ ڕۆشـنی؛ دەرکـەوتوویی؛ دیـاردەری؛ دۆخ یان چۆنیەتی ئاشکرا بوون؛ ڤیڤرین ‹وضوح عکس‌ها خوب نیست: ڕوونی وێنەکان باش نیە›.

**وطن / vatan ، ـها؛ اوطان/:** [عربـی]/*اسـم.* وەتـەن: ١. وڵات؛ وەڵات؛ وڵـــگە؛ نیشـــتمان ٢. زێـد؛ شـوێنی لـە دایـک بـوون ٣. ژێگـە؛ نشیمەن؛ نشـیمەنگا؛ مەڵـبەند؛ جێگـەی ژیـان؛ شوێنی دیماتی و مانەوەی هەمیشەیی ‹سال‌ها آن ده وطنش بود: ساڵەها ئەو دێیە ژێگەی بوو›.

▣ وطن کردن: نیشتەجێ بوون؛ جـێگیر بـوون؛ کردنە وەتەن؛ دامەزران.

**وطـن‌پرسـت / vatanparast ، ـها؛ ـان/:** [عربـی/ فارسـی]/*اسـم.* نیشـتمان‌پەرسـت؛ وڵات‌پـارێز؛ زێدپەرست؛ وڵات‌پەرست؛ وەتەن‌پرێس.

**وطن پرستانه** / vatanparastāne/: [عربی/ فارسی] *صفت.* نیشتمان‌پەرستانە.

**وطن پرستی** / vatanparastî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* نیشتمان‌پەرستی؛ وڵات‌پارێزی؛ وڵات‌پەرستی؛ وەتەن‌پرێسی؛ وەڵاتینی.

**وطنخواه** / vatanxāh ، ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* وڵات‌خواز؛ نیشتمان‌خواز؛ نیشتمان‌دۆس؛ وڵات‌دۆست.

**وطنخواهی** / vatanxāhî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* نیشتمان‌خوازی؛ وڵات‌دۆسی.

**وطن دوست** / vatandûst ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* نیشتمان‌خواز؛ نیشتمان‌دۆست؛ وەتەن‌دۆس.

**وطن دوستی** / vatandûstî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* نیشتمان‌خوازی؛ وڵات‌دۆسی.

**وطنی** / vatanî/: [عربی] *صفت.* نیشتمانی: ١. پێوەندیدار یان سەر بە وڵاتەوە ‹احساسات وطنی: **هەستی** نیشتمانی› ٢. درووس‌کراوی وڵات ‹کالای وطنی: کالای نیشتمانی›.

**وظائف** / vazā'ef/: [عربی] ☜ **وظایف**

**وظایف** / vazāyef/: [عربی] جمعِ ☜ **وظیفه: وظائف**

▣ **وظایف اعضا:** کارەندام؛ کارئەندامناسی؛ فیزیۆلۆژی.

**وظیفه** / vazîfe/: [عربی]/*اسم.* ١. ـ ـها؛ وظایف/ ئەرک؛ کار، ئاکار یان ڕاژەیێ کە لە کەس (بە هۆی بوون لە نێو تاقمێک) چاوەڕوانی دەکرێ ‹وظیفه‌ی ملی؛ وظیفه‌ی دینی: ئەرکی نەتەوەیی؛ ئەرکی دینی› ٢. ئیجباری؛ کار و خزمەتێکی دیاریکراو، بەتایبەت خزمەتی سەربازی ٣. ـ ـها؛ وظایف/ ئەرک؛ ئەرکی سەرشان؛ ئەوەی ئەخلاق یان قانوون بۆ مرۆڤی دەبڕێتەوە ‹وظیفه حکم می‌کرد ساکت ننشینیم: ئەرکی سەرشانمان بوو بێ‌دەنگ نەبین› ٤. ـ ـها؛ وظایف/ ئەرک؛ کار؛ هەرمانە؛ فەرمان؛ فرمان؛ کارێ کە کردنی لە ئەستۆی کەس یان شتێکدایە ‹وظیفه‌ی چشم دیدن است: کاری چاو دیتنە› ٥. مەواجب؛ مووچەیێ کە پاش مردنی کارمەند بە بنەماڵەی دەدرێ.

**وظیفه‌بگیر** / vazîfebegîr ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* مەواجب‌گیر؛ مەواجب‌گر؛ کەسێ کە مەواجب دەگرێ.

**وظیفه شناسی** / vazîfešenāsî/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* ئەرک‌ناسی؛ ئاگا بوون لە ئەرکی سەرشانی خۆ لە بەرامبەر خەڵکەوە. هەروەها: **وظیفه‌شناس**

**وعاظ** / vo'āz/: [عربی] جمعِ ☜ **واعِظ**

**وعد و وعید** / va'd-o-va'îd ، ـها/: [عربی]/*اسم.* کار و ڕەوتی دڵخۆش‌کردن و ترساندن (تێبینی: ئەوڕۆکە هەر بەمانای دڵخۆش‌کردنی پەیتا‌ـپەیتایە): **وعده وعید؛ وعده و وعید**

**وعده** / va'de ، ـها/: [از عربی]/*اسم.* ١. /مَواعید/ بڕیار؛ بەڵێن؛ گفت؛ پەیمان؛ وادە؛ وایە؛ کار یا ڕەوتی ڕاگەیاندنی کردنی کارێک لە داهاتوودا ‹وعده داده بود اسم او را در مدرسه بنویسد: بڕیاری دابوو ناوی لە قوتابخانەدا بنووسێ› ٢. ژەم؛ ژەمە؛ ژوم؛ ژەمەن؛ جەمەنان؛ جەم؛ هەلی نان خواردن ‹روزی دو وعده غذا می‌خورم: ڕۆژێک دوو ژەم نان دەخۆم› ٣. *[گفتاری]* دەنگ؛ بانگێشتن؛ بانگهێشتن ‹از ما برای فردا ناهار وعده گرفت: ئێمەی بۆ سبەی نیوەڕۆ دەنگ کرد› ٤. *[گفتاری]* بڕیار؛ ژوان؛ بەڵێن؛ گفت؛ وادەی چاو پێکەوتن ‹آن روز سر وعده حاضر نشد: ئەو ڕۆژە نەهاتە سەر بڕیارەکەی›.

▣ **وعده‌ی سر خرمن:** *[کنایی]* حەواڵەی سەر چاڵەبەفر؛ وادەی سەر خەرمان؛ وادەی بەتاڵ؛ بەڵێنێ کە جێبەجێ ناکرێ.

▣ **وعده دادن:** وادە دان؛ بەڵێن دان؛ قەوڵ دان؛ ڕاگەیاندنی بەڕێوە چوونی کارێک لە داهاتوودا.

وعده گرفتن: دەنگ‌کردن؛ بانگهێشتن کردن؛ بانگێشتن‌کردن؛ داوەت‌کردن.
به وعده وفا کردن: پەیمان بەڕێوە بردن؛ بەڵێن بەجێ‌هێنان؛ گفت/ قەوڵ بردنە ڕێوە؛ ئەنجامدانی کارێکی بەڵێن پێدراو.

**وعده خلافی / va'dexalāfî/:** [از عربی/ عربی] *اسم. [گفتاری]* پەیمان‌شکێنی؛ کاری لە سەر بڕیار نەمان؛ پەیمان شکاندن.

**وعده‌دار / va'dedār/:** [از عربی/ فارسی] *صفت.* ماوەدار؛ وادەدار ‹چک وعده‌دار: چەکی ماوەدار›.

**وعده‌گاه / va'degāh**، ـها/: [از عربی/ فارسی] *اسم.* جێژوان؛ ژوانگە.

**وعده وعید / va'deva'îd/:** [از عربی/ عربی] ☜ **وعد و وعید**

**وعده و وعید / va'de-o-va'îd/:** [از عربی/ عربی] ☜ **وعد و وعید**

**وعظ / va'z**، ـها/: [عربی] *اسم.* ئامۆژیاری؛ ئامۆژگاری؛ وتاردانێکی نەستەق و پڕ لە ئامۆژیاری دینی.

**وغ‌وغ / vaqvaq/:** *صوت.* قرەقڕ؛ قیرەقیڕ؛ قۆڕەقۆڕ؛ دەنگی لەسەریەکی بۆق.

**وفا / vafā/:** [عربی] *اسم.* ئەمەگ؛ وەفا؛ بەینەت؛ شۆن؛ سفەت؛ خۆڕاگری لە سەر ئیمان، دۆستی یان بەڵێن ‹خیلی باوفا بود، هرگز پدر و مادرش را فراموش نکرد: زۆر بە ئەمەک بوو، قەت دایک و باوکی لەبیر نەکرد›.

▣ وفا داشتن: بە ئەمەگ بوون؛ ئەمەگدار بوون.
وفا کردن: ۱. بەجێ هێنان؛ بردنە سەر؛ بەڕێوە بردن ‹به عهد خود وفا کردن: بەڵێنی خۆ بردنە سەر› ۲. گەیاندن؛ هێنان؛ بڕ کردن ‹عمرش وفا نکرد تا داماد شدن پسرش را ببیند: عومری نەیگەیاند کوڕەکەی بە زاوایی ببینێ›.

**وفات / vafāt/:** [عربی] *اسم.* کۆچی دوایی؛ دواکۆچ؛ مردن؛ تێدا چوون؛ مەرگ ‹دوم اسفند، سالگرد وفات استاد هژار: دووهەمی ڕەشەمە، سالەهاتی کۆچی دوایی مامۆستا هەژار›.

▣ وفات کردن/ یافتن: کۆچی دوایی‌کردن؛ (دوا) مالاوایی‌کردن؛ دنیای ڕوون بەجێ هێشتن؛ مردن ‹حافظ در سال ۷۹۲ هجری وفات یافت: حافز لە ساڵی ۷۹۲ی کۆچیدا، کۆچی دوایی کرد›.

**وفادار / vafādār**، ـها، ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ئەمەگدار؛ وەفادار؛ ئەمەگناس؛ بەینەتدار؛ ڕاوەستاو لە سەر بەڵێن و دۆستایەتی ‹دوست وفادار یک گنج است: دۆسی ئەمەگناس گەنجینەیە›.

**وفاداری / vafādārî**، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ئەمەگناسی؛ ئەمەگداری؛ وەفاداری؛ ڕاوەستاوی لە سەر بەڵێن، دۆستی، قسە و بڕوای خۆ.

**وفاق / vefāq/:** [عربی] *اسم.* هاوڕێیی؛ یەکگرتوویی؛ هاویاری؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی؛ پێکهاتن؛ ڕێک‌کەوتن؛ یەک‌گرتن ‹وفاق ملی: هاوڕێیی نەتەوەیی›.

**وفق / vefq/:** [عربی] *اسم. [ادبی]* تەبایی؛ سازش؛ سازشت.

▣ بر وفق مراد: بە کەیفی دڵ؛ بەرانبەر بە ویست؛ خۆزگەی دڵ ‹کارها بر وفق مراد پیش رفت: کارەکان بە کەیفی دڵ بەڕێوە چوون›.

▣ وفق دادن: ڕێکخستن؛ پێکهێنان؛ ڕاهێنان؛ ساز دان؛ ڕێک‌کەردەی؛ هەڤگەهین؛ هاوڕێ کردن ‹خودش را با مردم وفق می‌داد: خۆی دەگەڵ خەڵکدا ڕێک‌دەخست›.

**وفقی / vefqî/:** [عربی] *صفت.* تەبا؛ پێکهاتوو؛ سازگار ‹مربع وفقی: چوارگۆشەی سازگار›.

**وفور / vufûr, vofûr/:** [عربی] *اسم.* زۆری؛ فرەیی؛ فراوانی؛ زۆر و زەبەندی؛ مشەممەری.

**وفیات / vafayāt/:** [عربی] *اسم. [ادبی]* ڕۆیشتووان؛ کۆچ‌کردووان؛ مردووان.

**وقاحت / veqāhat, vaqāhat/:** [عربی] *اسم.* بێ‌شەرمی؛ بێ‌حەیایی؛ بێ‌ئابڕوویی؛ ڕووداری؛ ڕووداماڵاوی؛ سورتکی ‹وقاحت می‌خواهد که آدم به پدرش بگوید تو نمی‌فهمی، حرف نزن!: بێ‌شەرمی

دەوێ کەسێ بە بابی خۆی بڵێ تۆ نافامی، قسە مەکە!›.

**وقاد / vaqqād/:** [عربی] *صفت.[ادبی]* وریا؛ وشیار؛ شیار؛ وردبین؛ زیت و زیرەک.

**وقار / vaqār, veqār/:** [عربی]/سم. مەندی؛ سەنگینی؛ لەسەرخۆیی؛ گونجاوی لە ئاکار و قسەدا: *الف)* لەسەرخۆیی لە قسە و کردەوەدا *ب)* خۆپاریزی لە توندی و شلی.

**وقایع / vaqāye'/:** [عربی] جمعِ ☜ **واقِعه**

**وقایع‌نگاری / vaqāye'negārî ، ـها/:** [عربی/ فارسی]/سم. ڕووداونووسی؛ کار و ڕەوتی نووسینی گوزارشی ڕووداوان. هەروەها: **وقایع‌نگار**

**وقت / vaqt ، ـها/:** [عربی]/سم. کات؛ وەخت؛ کات و سات: ۱. هەل؛ زەمان ‹وقت طلاست: کات زێڕە› ۲. /اوقات/ دەم؛ هەل؛ تان؛ دان؛ ئان؛ عان؛ حان؛ چاخ؛ زەمان؛ گام؛ گامە؛ گۆم؛ گاڤ؛ گاو؛ گڕ؛ کێلی؛ بەنگ ‹وقت بازی؛ وقت رفتن: کاتی کایە؛ هەلی ڕۆیشتن› ۳. زەمانێک کە بە پێی کاتژمێر بۆ هەر شوێنێک دیاریکراوە ‹ساعت چهار به وقت اربیل: کاتژمێری چوار بە کاتی هەولێر› ٤. هەل؛ تان؛ دان؛ ئان؛ حان؛ کێلی؛ بەنگ؛ ماوەیەک کە بۆ کارێک تەرخان‌کراوە ‹فقط سه دقیقه وقت داری: تەنیا سێ خولەک وەختت هەیە›.

◙ وقت آزاد: کاتی بەتاڵ؛ ئەو کاتەی مرۆڤ لە کار و ئەرک دەبێتەوە: **وقت فراغت**

وقت اداری: کاتی مەزرینگەیی؛ وەختی ئیداری؛ ئەو بەشە لە ڕۆژ کە لە مەزرینگە کار دەکرێ.

وقت شرعی: کاتی شەرعی؛ کاتی دیاریکراو بۆ بەڕێوە بردنی عیبادەت.

وقت فراغت ☜ **وقت آزاد**

وقت گل نی: گوڵێ بێتەو لە کانی؛ شەمە بڕیۆ مانگەنە؛ هیچ کات ‹گفتم کی بر می‌گردی؟ گفت وقت گل نی!: وتم کەی دەگەڕێتەوە؟ وتی گوڵێ بێتەو لە کانی!›.

وقت ملاقات: کاتی/ چاو پێکەوتن/ دیتن/ دیمانە ‹امروز از وزیر وقت ملاقات گرفتم: ئەوڕۆ لە وەزیر کاتی چاوپێکەوتنم وەرگرت›.

اول وقت: سەر لە بەیانی؛ سوح زوو؛ سەرەتای دەسپێکردنی کاری ڕۆژانە.

این وقت روز: ۱. ئاوا دێر؛ کاتێک لە ڕۆژ ڕۆیشتوو ۲. ناوەخت؛ نەک لە کاتی خۆیدا.

این وقت شب: ۱. بەو نیوەشەوەدا؛ ئابەم شەوا ۲. ناوەخت؛ نەک لە کاتی خۆیدا.

سر وقت ☜ **سر**[3]

◙ وقت بردن: خایاندن؛ کات بردن؛ کودان؛ کوداندن؛ پێ‌چوون؛ وەخت بردن ‹این کار یک ماه وقت می‌برد: ئەم کارە مانگێک دەخایەنێ›.

وقت خواستن: کات/ وەخت ویستن؛ وەخت داوا کردن؛ وەخت گەرەک بوون: ۱. داوای کات کردن بۆ چاو پێکەوتن ‹از رییس وقت خواستم بروم پیشش: لە سەرۆک وەختێکم داوا کرد بچمە لای› ۲. ماوە ویستن؛ دەرفەت خواستن ‹چند روزی وقت خواستم تا درباره‌اش فکر کنم: چەن ڕۆژێک ماوەم ویست تا بیری لێ بکەمەوە›.

وقت دادن: کات دان؛ وەخت دان: ۱. بەرایی دان بۆ دیمانەیەک لە سەر کاتی دیاریکراودا ‹فردا ساعت ۸ وقت ملاقات داده: بۆ سبەی ساعەتی ۸ وەختی داوە› ۲. ماوە دان؛ دەرفەت دان؛ مووڵەت دان.

وقت داشتن: وەخت بوون؛ دەرفەت هەبوون ‹وقت داری برویم تئاتر؟: وەختت هەیە بڕۆینە تیئاتر›.

وقت سر خاراندن نداشتن/ نیافتن: یەکجار سەرقاڵ بوون.

وقت کردن: کات هەبوون؛ دەرفەت دۆزینەوە ‹اگر وقت کردی بیا برویم تئاتر: ئەگەر کاتت هەبوو با بڕۆین بۆ تیئاتر›.

وقت کسی را گرفتن: کات/ وەختی کەسێک

گرتن؛ بوونە هۆی لە کار بوونی کەسێک ‹آمد و دو ساعت وقت همه را گرفت: هات و دوو سەعات کاتی هەمووی گرت›.

وقت گذاشتن: کات دانان؛ وەخت دانیان ‹دو روز وقت گذاشتم و تمامش را خواندم: دوو ڕۆژ وەختم دانا و هەموویم خوێندەوە›.

وقت گذراندن: خۆ خلافاندن؛ کات دانە سەر ‹دو ساعت در خیابان وقت گذراندم تا شب شد: دوو سەعات لە شەقامدا خوم خلافاند تا بوو بە شەو›.

وقت گذشتن: کات تێپەڕ بوون؛ کات بە سەر چوون؛ دەم نەمان: ١. تێپەڕ بوونی ماوەیەکی دیاریکراو ‹وقت چه زود می‌گذرد!: چەندە خێرا کات تێپەڕ دەبێ!› ٢. وەخت/ کات لادان؛ دێر بوون؛ نەمان و تێپەڕ بوونی کات و دەرفەتێکی لەبار بۆ ئەنجامدانی کارێک ‹وقت خواب دیگر گذشت، باید بروم سر کار: لە وەختی خەو لای دا، دەبێ بڕۆمە سەر کار›.

وقت گرفتن: وەخت‌گرتن؛ کات‌گرتن: ١. لە کەسێک بەرایی گرتن بۆ دیمانە لە کاتێکی دیاریکراودا ‹برای سارا از دکتر وقت گرفتم: بۆ سارا لە دوکتور وەختم گرت› ٢. ئەندازە گرتنی کاتی پێویست بۆ کار یان ڕەوتێک ‹وقت بگیر ببینم چقدر طول می‌کشد: کات بگرە بزانم چەندی دەخایێنێ› ٣. کات/ وەخت بردن؛ خایاندن؛ بەشێکی دیاریکراو لە کات داگرتن ‹این کار ده روز وقت گرفت: ئەم کارە دەڕۆژ کاتی گرت›.

**وقت‌شناس** / vaqtšenās/: [عربی/ فارسی] *صفت*. وەخت‌ناس؛ کات‌ناس؛ وادەدرووس؛ بە خوو و خدەی ئەنجامدانی کار لە سەروەختی دیاریکراودا.

**وقت‌شناسی** / vaqtšenāsî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. وەخت‌ناسی؛ کاتناسی؛ وادەدرووسی؛ دۆخ یان چۆنیەتی وەخت‌ناس بوون.

**وقت‌کش** / vaqtkoš/: [عربی/ فارسی] *صفت*. وەخت‌کوژ؛ کات‌کوژ؛ زۆرخایەن و بێ‌کەلک.

**وقت‌کشی** / vaqtkošî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. وەخت‌کوژی؛ کار و ڕەوتی کات بە فیڕۆ دان.

**وقت‌گذرانی** / vaqtgozarānî ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. کار و ڕەوتی خۆ خلافاندن؛ کات بە سەردان؛ وەخت گوزەراندن؛ پڕکردنەوەی کات بە شتی هیچ‌وپووچ و لە بەر بێکاری.

**وقتگیر** / vaqtgîr/: [عربی/ فارسی] *صفت*. کاتبەر؛ درێژخایەن؛ وەختگیر؛ بە پێویست بۆ تێپەڕانی کاتێکی زۆر ‹این کار خیلی وقتگیر است: ئەم کارە زۆر کاتبەرە›.

**وقت‌نگهدار** / vaqtnegahdār ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم*. کات‌ڕاگر؛ ئەو کەسە کاتی بەسەرچوو لە یاریەکدا ئەندازە دەگرێ.

**وقت و بی‌وقت** / vaqt-o-bîvaqt/: [عربی/ فارسی/ عربی] *قید*. وەخت و ناوەخت؛ گا و بێ‌گا؛ گوڕای‌گوڕ؛ بەشێوەی پەیتاپەیتا و لە کاتی نالەباردا ‹صاحبخانه وقت و بی‌وقت می‌آمد و پول اجاره‌اش را می‌خواست: ساحێب‌ماڵ وەخت و ناوەخت دەهات و داوای کرێماڵەکەی دەکرد›.

**وقتی** / vaqtî/: [عربی] *قید*. کاتێک؛ کاتێ؛ لە کاتێکدا؛ وەختێک؛ لە وەختێکدا؛ وەختێو؛ وەختیە: ١. لەو کاتەدا؛ لەو دەمەدا؛ ئەو کاتە؛ ئەو دەم؛ ئەو کات ‹وقتی تو آمدی، شام می‌خوردیم: کاتێک تۆ هاتی، شێومان دەخوارد› ٢. وەختارێ؛ وەختارێو؛ هەر کات؛ هەر دەم ‹وقتی تو نمی‌خواهی کاری بکنی صد تا بهانه می‌تراشی: کاتێ نەتەوێ کارێک بکەی سەد بیانوو دێنیتەوە›.

**وق‌زده** / vaqzade/: *صفت*. *[گفتاری]* زاق؛ دەرپەڕیو؛ بۆق؛ ماق؛ زەق؛ بەرپڕا؛ داپچڕاو ‹چشم وق‌زده: چاوی دەرپەڕیو›.

**وقس علیهذا** / vaqes'alāhāzā/: [عربی] *قید*. ١. هەروەها؛ هەرئاوەها؛ وە هەروەها؛ هەروەسا؛ هەرپاسە ٢. وا لێکی‌دەوە.

**وقع** / vaq'/: [عربی] *اسم*. *[ادبی]* بایەخ؛ گەم؛ گرینگیەتی؛ گرینگی؛ بڕ؛ ئەرزش؛ وەح.

⊡ وقع نهادن: بایەخ دان/ دانان؛ گرینگی پێدان.

**وقف** / vaqf ، ـها/: [عربی]/اسم. وەقف: ١. بڕیارێ کە دان و ستان و دەستێوەردانی ماڵ یا مڵکێ قەدەغە دەکا و داهاتیشی تەنیا بۆ کار یان شوێنێکی تایبەت دەبێ ٢. /اوقاف/ مڵک یان ماڵ و داراییەک کە بڕیاری وای لە سەر دراوە.

⊡ وقف خاص: وەقفی تایبەتی؛ وەقفێ کە داهاتی بۆ کەسانێکی‌تر تەرخان‌کراوە.

وقف عام: وەقفی گشتی/ هەمووانی؛ وەقفێ کە بۆ کەڵکی هەمووانە.

**وقف‌نامه** / vaqfnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]/اسم. وەقف‌نامە؛ نووسراوەیێ کە بڕیار لە سەر وەقف بوونی شتێک دەدا.

**وقفه** / vaqfe ، ـها/: [عربی]/اسم. گت؛ لەنگە؛ لەنگی: ١. ئاشۆ؛ مەودایەک لە ڕەوتی کارێکدا ‹به علت از کار افتادن ماشین، یک هفته در کارمان وقفه افتاد: بە هۆی لەکارکەوتنی ماشینەکە، حەوتەیەک کارەکەمان تووشی گت بوو› ٢. کار یا ڕەوتی وەستان؛ وێسان؛ ڕاوەستان؛ وێسیان ‹کار ساختمان دچار وقفه شده است: کاری خانووبەرەکە ڕاوەستاوە›.

**وقفی** / vaqfî ، ـها/: [عربی] صفت. وەقفی؛ وەقف‌بوو ‹خانه‌ی وقفی: ماڵی وەقفی›.

**وقوع** / vuqû', voqû'/: [عربی]/اسم. ڕووداوی؛ قۆماوی؛ قەوماوی.

⊡ وقوع یافتن: ڕوودان؛ پێش هاتن؛ قەومیان؛ قۆمیان؛ قۆمیەی؛ قۆمیای ‹در آن خانه قتلی وقوع یافته بود: لەو ماڵە قەتڵێ ڕوویدابوو›: **به وقوع پیوستن**

به وقوع پیوستن ☜ **وقوع یافتن**

**وقوف** / vuqûf, voqûf/: [عربی]/اسم. ئاگایی؛ شارەزایی؛ بەخەبەری.

⊡ وقوف داشتن: ئاگادار بوون؛ خەبەر لێ بوون؛ شارەزا بوون؛ بەخەبەر بوون؛ هاگەدار بیەی ‹او به همه‌ی امور اداره وقوف داشت: ئەو لە هەموو کار و باری مەرزینگە ئاگادار بوو›.

وقوف یافتن: شارەزا بوون؛ ئاگادار بوون؛ بەخەبەر بوون ‹از اول کوشید به همه‌ی امور وقوف یابد: لە سەرەتاوە هەوڵی دا لە هەموو کار و بارێک شارەزا بێ›.

**وقیح** / vaqîh/: [عربی] صفت. بێ‌شەرم؛ بێ‌ئاوڕوو؛ بێ‌ئابڕوو؛ بێ‌حەیا؛ کولەش؛ کەلپزا؛ کەلپزە؛ ڕووداماڵیاگ؛ سورتک؛ چەتاوەڕوو؛ چەرداوەڕوو؛ چەقاوەسوو.

**وقیحانه**[1] / vaqîhāne/: [عربی/ فارسی] صفت. بێ‌شەرمانە؛ ڕوودارانە؛ بێ‌ئابڕوویانە؛ بێ‌حەیایانە؛ بێوەری لە شەرم و شوورەیی زانین ‹رفتار وقیحانه: ئاکاری بێ‌شەرمانە›.

**وقیحانه**[2]: قید. بێ‌شەرمانە؛ بێ‌حەیایانە؛ بەبێ شەرمیەوە؛ بەبێ حەیاییەوە؛ بەبێ شەرم و شوورەیی زانین ‹وقیحانه خندید و گفت شوخی کردم: بێ‌شەرمانە پێکەنی و گوتی گاڵتەم کرد›.

**وکالت** / vekālat ، ـها/: [عربی]/اسم. ١. بریکاری؛ پارێزەری؛ کار یان پیشەی بریکار ‹وکالت متهم را پذیرفت: بریکاری بەرتاوانەکەی وە ئەستۆ گرت› ٢. نوێنەری؛ نوێنەرایەتی ‹به وکالت مجلس انتخاب شد: بە نوێنەرایەتی پەرلەمان هەڵبژێردرا›.

⊡ وکالت دادن: نمیناندن؛ کردنە بریکار؛ وەکاڵەت دان؛ بە ناوی بریکار کەسێک دەس‌نیشان کردن ‹به برادرم وکالت دادم خانه را بفروشد: براکەمم نمباند خانووەکە بفرۆشێ›.

وکالت کردن: بریکاری‌کردن؛ وەکاڵەت‌کردن؛ بەڕێوەبردنی کار و ئەرکی بریکاری ‹سه سال است در بیجار وکالت می‌کند: سێ ساڵە لە بیجاڕدا بریکاری دەکا›.

**وکالتا** / vekālatan/: [عربی] قید. بە بریکاری؛ وەک بریکار؛ بە ناوی بریکار. بەرانبەر: **اصالتاً** ‹وکالتا از طرف شرکت اقامه‌ی دعوا کرد: بە بریکاری لە لایەن شیرکەتەوە دادخوازی کرد›.

**وکالت‌نامه** / vekālatnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]

/اسم. بریکاری‌نامه؛ وەکالەت‌نامە؛ نووسراوەیەک کە بە پێی ئەوە کەسێک، کەسێکی‌تر وەک بریکاری خۆی دەناسێنێ.

**وکالت‌نامه‌ای / vekālatnāme'î/:** [عربی/ فارسی] قید. وەکالەت‌نامەیی؛ بە وکالەتنامە؛ لە ڕێگەی بریکارینامەوە ‹تلفن را وکالت‌نامه‌ای واگذار کرد: تەلەفوونەکەی وەکالەت‌نامەیی دا›.

**وکالتی / vekālatî/:** [عربی] صفت. بریکاری؛ بریکارانە؛ وەکالەتی؛ سەر بە بریکار ‹امور وکالتی: کار و باری بریکاری›.

**وکلا / vokalā/:** [عربی] جمعِ ☜ **وکیل**

**وکیل / vakîl** ، ـها؛ ـان؛ وُکَلا/: [عربی]/اسم. بریکار: ١. وەکێل؛ دەمڕاس؛ کەسێ کە لە لایەن کەسێکی‌ترەوە بۆ ئەنجامدانی کارێک ڕادەسپێردرێ ‹آزاد را وکیل خودم کردم تا خانه‌ی سردشت را بفروشد: ئازادم کردە بریکاری خۆم، مالەکەی سەردەشت بفرۆشێ› ٢. نەوەنگە؛ بەندەر؛ نوێنەر؛ نیوەر؛ نۆنەر ‹وکیل اول ایلام بود: نوێنەری یەکەمی ئیلام بوو› ٣. ناڤبێژ؛ پارێزەر؛ مافپارێز ‹وکیل متهم، پرونده را نخوانده بود!: بریکاری بەرتاوانەکە، پەروەندەکەی نەخوێندبۆوە!›.

▣ **وکیل تسخیری:** ناڤبێژی سەپاو؛ بریکاری دیاریکراو؛ بریکارێ کە دادگا بۆ لە سەر کردنەوەی بەرتاوان، هەڵدەبژێرێ.

**وکیل دادگستری:** بریکاری داد؛ ئاوقات؛ ئاوقاتی؛ مافزانێک کە خەلک بۆ دادخوازی ڕێنوێنی دەکا و پارە وەردەگرێ.

**وکیل مجلس:** نوێنەری پەرلەمان؛ نوێنەری ئەنجوومەن.

**وکیل مدافع:** بریکار؛ پارێزەر؛ ناڤبێژ؛ نافبێژە؛ قانوونزانێک کە لە دادگا لە سەر کردنەوە و پاراستنی مافی بەرتاوانی گرتۆتە ئەستۆ.

**وگرنه / vagarna/:** قید. دەنا؛ ئەنا؛ ئەگینا؛ ئەگەنا؛ ئەگەرنە؛ ئەگەرنا؛ ناکۆ؛ ئنا؛ وەرنا؛ وەرنە؛ یانە؛ وەئیلا؛ وەگەرنە؛ ئەگەر وا نەبێ ‹باید کار تمام شود وگرنه من نمی‌آیم: دەبێ کارەکە دوایی بێت دەنا من نایەم›.

**ول / vel/:** صفت. وێڵ؛ ڤێل؛ وەل: ١. *[گفتاری]* وەر؛ ڕەها؛ بەرەڵا ‹ول کردن: وێل کردن› ٢. فێرۆ؛ بێ‌ئامانج؛ لەخۆڕایی؛ بێخۆ ‹ول گشتن: وێل گەڕیان›.

▣ **ول چرخیدن:** وێڵ گەڕان/ گەڕیان؛ وێڵ-وێڵ خولانەوە؛ وێڵ- وێڵ گەڕان/ گێلەی؛ لەخۆڕا سووڕ خواردن؛ بێخۆ یان بێ‌ئامانج هات‌وچۆ کردن ‹برای چه ول می‌چرخی؟: بۆچی وێل دەگەڕی؟›.

**ول دادن:** بەردان؛ وێڵ‌کردن؛ وەردەی ‹تناب را ول داد به پایین: تەنافەکەی بەردا بۆ خوارەوە›.

**ول کردن:** بەردان؛ ئازادکردن؛ وێل کردن؛ وەردای؛ وێل‌کەردەی؛ ڤێل‌کرن؛ بەرەڵلا کردن ‹گنجشکی را که گرفته بود ول کرد: ئەو چۆلەکە گرتبووی بەرەللای کرد›.

**ول گشتن:** وێل‌گەڕیان؛ لە خۆڕا سووڕ خواردن؛ بێخۆ خول خواردنەوە ‹توی خیابان ول می‌گشتم: لە نێو شەقامدا وێڵ دەگەرام›.

**ول گفتن:** گەوجانە ڕستن؛ قسەی مفت/ بێخۆ/ گەوجانە/ قۆڕ کردن؛ مفت‌بێژی‌کردن ‹از ول گفتن و حرف بیخود زدن خوشش می‌آید: بە گەوجانە ڕستن و قسەی قۆڕ کردن کەیفی سازە›.

**ول معطل بودن:** لە هیچ مەحتەل بوون؛ بێخۆ بە تەما بوون؛ لە خۆڕا ماتڵ بوون ‹فهمیدم در آن شرکت ول معطلم، راهم را کشیدم و آمدم بیرون: زانیم لەو شیرکەتەدا لە هیچ مەحتەلم، ڕێی دەرەوەم گرتە بەر و هاتم›.

**ول / vol/:** [؟] ☜ **اُرس**

**ولا / valā/:** [عربی]/اسم. *[ادبی]* دۆسی؛ دۆستی؛ دۆستایەتی؛ دۆسایەتی؛ هەڤالی؛ هەوالی.

**ولادت / velādat/:** [عربی]/اسم. وەلدین؛ لە دایک بوون؛ پەیدا بیەی؛ چاو هەلهێنان:

١. ڕەوتی هاتنــە دنیــا ‹در سـال ٥٣٩ هجـری در سُهرورد ولادت یافت: لـە سالـی ٥٣٩ی کـۆچی لـە سوورەبەرد لە دایک بوو› ٢. /ـها/ [مجازی] ڕۆژی لە دایک بوون ‹ولادت فرزندت را تبریـک مـی‌گـویم: لە دایک بوونـی منداڵەکەت لێ پیرۆز بێ›.

**ولایات** / velāyāt/: [عربی] جمعِ ☜ **ولایَت**

**ولایت** / velāyat/: [عربی]/اسم. ١. /ـها؛ ولایات/ [قدیمی] ولات؛ وەلات؛ وەڵات ‹ولایـت کردسـتان: ولاتـی کوردستان› ٢. [گفتاری] شار یـان گونـدی بێجگــە لــە پاتــەخت ٣. لادێ؛ دێ؛ ئــاوایی ٤. سەرپەرشتی؛ خوێداری.

**ولایتـی** / velāyatî/: [عربـی] صفت. لادێیـی؛ لادەگـایی؛ دێهـاتی؛ پێوەندیـدار یـان سـەر بـە دێهاتەوە ‹لهجەی ولایتی: زاراوەی لادێیی›.

**ولـت** / volt/: [فرانسـوی]/اسم. ولـت؛ یەکـەی پێوانی ڕەوتی کارەبایی.

**ولتـاژ** / voltāj/: [فرانسـوی]/اسم. ولـتاژ؛ ڕادەی هێزی بزوێنەری کارەبایی بە گوێرەی ولت.

**ولـت‌آمپـر** / voltāmper/: [فرانسـوی]/اسم. ولت‌ئامپێر؛ یەکـەی پێـوانی هێـزی کارەبـا کـە دەکاتە یەک ولت لە یەک ئامپێردا.

**ولتـامتر** / voltāmetr، ـهـا/: [فرانسـوی]/اسم. ولــتامیتر؛ کەرسـتەی پێـوانی ڕادەی کارەبـای تێپەڕیو لە سیمێک.

**ولت سـنج** / voltsanc/: [فرانسـوی/ فارسـی] ☜ **ولتمتر**

**ولتمتر** / voltmetr، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ولتمیتر؛ کەرەسەیەک بۆ پێوانی جیاوازی پوتانسیەل لـە خالـی جۆراوجـۆری خولگەیەکـدا بـە گـوێرەی ولت: **ولت‌سنج**

**ولخرج** / velxarc، ـهـا/: [فارسـی/ عربـی] صفت. هەڵەخەرج؛ ئەبلەخەرج؛ دەسبلاو؛ دەسـت‌بـلاو؛ دەسـبا؛ دەسـباد؛ دەس‌شـاش؛ دەسـت‌شـاش؛ قەللاش؛ دەست بە قـرپ؛ گەنەخـەرج؛ خـاوەن خوو و خدە یان ئۆگرەتی بە خەرج‌کردنی بـەبێ هۆ ‹آدم ولخرج مثل تو کی می‌تواند پس‌انـداز کنـد؟: کەسـی هەڵـەخەرجی وەکـوو تـۆ، کـەی دەتوانـێ پاشەکەوتێ خا؟›.

**ولخرجی** / velxarcî، ـها/: [فارسـی/ عربـی]/اسم. هەڵەخەرجی؛ چەنگ‌لفـە؛ دەسـبلاوی؛ بـاش و بۆشی؛ کاری ماڵ بە خۆڕایی خەرج کردن ‹تو به خریدن لباس و وسیلەی کـار مـی‌گـویی ولخرجـی؟: تـۆ سەندنی جل‌وبەرگ و کەرسـتەی کـار، نـاو دەنێـی هەڵەخەرجی؟›.

**ولــرم** / velarm/: صـفت. شـیتین؛ شـیرتین؛ شیلەتین؛ شیرەوتین؛ شـلەتین؛ شـەلۆ؛ شـیلوو؛ شلوێ؛ مڵەما؛ نیوەگەرم؛ نیمەگەرم؛ شیرەگەرم؛ شیلە و گەرم؛ تراوی نە سارد و نە داخ ‹آب ولرم: ئاوی شیرتین›.

**ولش** / velš/: [انگلیسـی]/اسم. ویلـش: ١. /ــها/ خەڵکی ناوچەی ویلز (لە بریتانیا) یان لەو ڕەتەوە ٢. لە زمانەکانی سێلتی، زمانی خەڵکی ویلز.

**ولع** / vala'/: [عربی]/اسم. [ادبی] چلێسـی؛ چـڵ؛ چنـۆکی؛ واز و حـەزی پـەت‌بـڕاو بـۆ کـردنی کارێک.

**ولفرام** / volf(e)rām/: [انگلیسی] ☜ **تَنگستَن**

**ولفرامیـت** / volf(e)rāmît/: [انگلیسـی]/اسم. ڤولفرامیت؛ کانزای تەنگستەن.

**ولکانیـت** / volkānît/: [فرانسـوی]/اسم. [شیمی] ڤولکانیت؛ لاستیکی سەختی بەرهـەم‌هـاتوو لـە تین دانی کائۆچۆ دەگەڵ گۆگرد.

**ول کن** / velkon/: صفت. [گفتاری] دەس‌هەڵـگر؛ دەسهەڵـگیر؛ دەسەڵـگر؛ دەسـت‌بــەردار؛ دەسبەردار؛ وازهێنەر؛ لەبار بـۆ دەسـبەردان لـە بڕیار، کـار یـا ئاکـارێکی خـۆ ‹ول‌کن دعوا نبود: دەس‌هەڵگری شەڕەکە نەبوو›.

⊡ **ول کـن نبـودن**: دەسهەڵـگر نـەبوون؛ دەس‌هەڵـگیر نـەبوون؛ دەسـبەردار نـەبوون؛ شێلگیر بوون.

**ولگرد** / velgard، ـها؛ ـان/: صفت. گەڕاڵ؛ لووگی؛

بێکاره؛ بەرەڵا؛ بەرهەڵدا؛ هەڵەگەڕ؛ کۆڵانی؛ خوێڕی؛ بەتاڵپا؛ خوتوخوێڕی؛ گەڕیانۆخ؛ قەلاش؛ دەرگێڵ؛ فستووقی؛ بەبێ شوێن و کاری بەرچاو ‹جوانان ولگرد روزبەروز بیشتر می‌شوند: لاوانی گەڕاڵ ڕۆژ لە دووی ڕۆژ زۆرتر دەبنەوە›.

**ولگردی** / velgardî ، ـها/: اسم. گەڕاڵی؛ بەرەڵایی؛ بەتاڵپایی؛ خوێڕیگەری؛ خوێڕیەتی؛ هەڵەگەڕی؛ دەرگێڵی: ۱. دۆخ یان چۆنیەتی بێکار و بێ ڕێ و شوێن بوون ۲. کاری خولانەوەی بێخۆ و بێ ئامانج.

**ولنگار** / velengār ، ـها؛ ـان/: صفت. ۱. بێ‌هەوسار؛ بێ‌هەفسار؛ سەربزێو ۲. کەمتەرخەم؛ بێ‌خەیاڵ. هەروەها: **ولنگاری**

**ولنگ و واز** / veleng-o-vāz/: صفت. *[گفتاری]* ۱. بەرەڵا؛ وێڵ؛ بێ‌بار؛ پرتۆک؛ گەوەند؛ گەللا؛ بێ لە بەرچاو گرتنی دابونەریتی کۆمەڵگا ۲. وراق؛ پان‌وپۆڕ؛ گەورەی بێ‌بایەخ ۳. بەرز (هەنگاو).

**ولنگیدن** / velangîdan/: مصدر. لازم. *[گفتاری]* // **ولنگیدی:** خوێندت؛ **می‌ولنگی:** دەخوێنی؛- // خوێندن؛ هەڵسکانن؛ پاشەملەگوتن؛ پاشملە وتن؛ پاشملە لێ‌دوان؛ پشتە سەر قسەکردن؛ پشتەمل قسەکردن؛ لە نەبوونی کەسێکدا، خراپە وتنی ‹می‌نشینند و پشت سرمان می‌ولنگند کە بلە او آدم بشو نیست: دادەنیشن و لە پشتەسەرمانەوە دەخوێنن کە فلانی نابێ بە بنیادەم›.

**ولو** / valow, valo:/: [اعربی] قید. ئەگەریش؛ ئەگەریچ؛ ئەگەرچی؛ تەنانەت؛ گەرچی؛ ئەگەرچی ‹پولم را ولو بە زور، از او خواهم گرفت: پوولەکەم ئەگەریش بە زۆر بێ لێی دەستێنم›.

**ولو** / velo, velow, velo:/: صفت. *[گفتاری]* ۱. پان؛ تخێڵ؛ ڕەهێل ‹ولو شد روی زمین: پان بۆوە بە سەر زەویدا› ۲. پرژ و بڵاو؛ پەرژ؛ پرش‌وبلاو؛ پرش؛ وەلا؛ بلاو؛ پژگ و بلاو؛ هاویر ‹پول‌هایش را روی میز ولو کرد: پوولەکانی پرش‌وبلاو کردە سەر مێزەکەدا›.

▣ **ولو شدن:** ڕەهێل بوون؛ تخێل بوون؛ تەخت بە زەویدا درێژ بوونەوە. هەروەها: **ولو بودن؛ ولو کردن**

**ولوله** / velvele ، ـها/: [عربی] اسم. زلە؛ هەرا و هوریا: ۱. لیلیلە؛ قوو؛ گرم و قاڵ؛ هەرا ـ هەرا؛ قالەقاڵ؛ زەنا ـ زەنا؛ دەنگ و هەرای زۆر ‹ببین چە ولولەای است!: چاو چ زلەیەکە!› ۲. بشێوە؛ پاشاگەردانی ‹توی شهر ولوله بود: شار بشیوە بوو›.

▣ **ولوله افتادن:** ۱. زلە هەستان؛ بوونە زەلە؛ گرم و قاڵ لێکەوتنەوە ۲. بشێوە قەومان؛ بوون بە ئاژاوە. هەروەها: **ولوله انداختن؛ ولوله کردن**

**ولوم** / volûm/: [انگلیسی] اسم. ولۆم؛ پێچی کەم و زۆر کردنی دەنگی دەزگایەکی دەنگدەر.

**ولونتاریست** / volûntārîst ، ـها/: [فرانسوی] صفت. وڵوونتاریست؛ شوێنکەوتوو یان لایەنگری وڵوونتاریسم.

**ولونتاریستی** / volûntārîstî/: [فرانسوی] صفت. وڵوونتاریستی؛ پێوەندیدار بە وڵوونتاریسمەوە.

**ولونتاریسم** / volûntārîsm/: [فرانسوی] اسم. وڵوونتاریسم؛ وڵوونتاریزم: ۱. بڕوا بەوەی کە هێزی ویستی مرۆ لە بەدیهێنانی هەر خوازەیەکدا دەوری گرینگ و سەرەکی دەگێڕێ ۲. *[سیاست]* بڕوا بەوەی کە پێشەوا یان پارتێکی سیاسی دەتوانێ بە کار و کردەوەی خۆی بار و دۆخی سیاسی بگۆڕێ ✲ **ارادەگرایی**

**ولی** / valî ، اولیا/: [عربی] اسم. ۱. سەرپەرەست؛ سەرپەرشت ۲. وەلی؛ قەدیسی موسڵمانان؛ پیاوی ئاسمانی کە دەگەڵ خودادا دۆستە.

▣ **ولی دم:** *[فقه]* خاوەن خوێن؛ خوێنەخوا؛ میراتبەری باڵغ و پێگەیشتووی کەسی کوژراو.

**ولی** / valî:/: [از عربی] حرف. بەلام؛ بەڵان؛ وەلێ؛ وەلێکان؛ وەلێکانێ؛ لێ؛ بەلێ‌پا؛ بەس؛ ئەمما؛

بەڵ؛ پیتی هاوێر ‹می‌خواستم بروم، ولی هواپیما نبود: دەمەویست بڕۆم، بەڵام فڕۆکە نەبوو›.

**ولیعهد** / valî'ahd ، ـها/: [عربی]/اسم. وەلیعەهـد؛ ئەو کەسەی لە سەرینایەتی پادشادا، بۆ جێگری ئەو ناودێر دەکرێ.

**ولیعهدی** / valî'ahdî/: [عربی]/اسم. وەلیعەهدی؛ پلە و پایە یان کاری وەلیعەهد.

**ولیک** / valîk ، ـها/: [؟]/اسم. گۆیژ؛ گوویژ؛ گویژ؛ گیووژ؛ گفیشک، گیڤشک؛ بلـچ؛ دارەپنچکێکـی دڕکاوی بە گوڵی سپی مەیلەو پەمەیی و بـەری خڕیلانەی گۆشتن و سوور و زەردەوە.

**ولیکن** / valîkan/: [عربی] حرف. بـەلام؛ وەلـێ؛ وەلێکان؛ وەڵێکانێ.

**ولیمه** / valîme ، ـها/: [عربی]/اسم. مێـوانی؛ مێمانی؛ سوور؛ میوانی بە بۆنەیەکی خۆشەوە.

**ولی‌نعمت** / valîne'mat ، ـها/: [عربی]/اسم. ئـەو کەسە هۆشی بە کەسـێکەوەیە و ژیـانی دابـین دەکا.

**ون** / van ، ـها/:/اسم. دارەون؛ داربەن؛ بناو؛ بناڤ؛ بەناڤ؛ بەناو؛ وناو؛ بناوی؛ بناوەچ؛ بناوچ؛ ونـاوچ؛ زوانەمەلووچکە؛ زوانەمەلیچک؛ داری کورتەبالای لە تیرەی زەیتوون بـە گـەلای برگـە‌ـ برگـەی پشت لووس و گوڵی سپی و میوەی خێـرداروەوە کـە لـە قـەدپاڵ و پاڵـداوێنی زاگرۆسـدا زۆرە و بنێشتی لێ‌دەگرن.

**وند**[1] / vand ، ـها/:/اسم.[دستور] بەند؛ وەند؛ وەن؛ یەک یان چەن برگە یان پیت کـە بـە سـەرەتا، ناوەڕاست یان ئاخری وشەوە دەلکێ و مانایەکی نوێی پێ‌دەدا.

**ـ وند**[2]: *پسوند.* ـگر؛ ـ بەند ‹پسوند؛ میانوند: پاشـگر؛ نێوانگر›.

**ونگ** / vang/: *صوت.[گفتاری]* زوورە؛ زیرە؛ زیـق؛ زیقە؛ زریکە؛ قیژە و هاواری بـەرزی گیانـدارانی بچـــووک (وەک منداڵـــی ســـاوا، پشـــیلە و تووتکەسەگ).

◘ ونگ زدن: زریکانـدن؛ زیقانـدن؛ زریکنـەی؛ زوورەکـردن؛ زریکـەزریک‌کـردن؛ زیڕانـدن؛ زیڕەزیڕکردن.

**ونوس** / venûs/: [فرانسوی]/اسم. ناهیـد؛ زوهـرە؛ دووهەمین گەڕۆکی خولگـەی هـەتاوی کـە لـە ڕووناک‌ترین تەنەکانی ئاسمانە.

**ووشو** / vošo, vûšo/: [انگلیسی از چینی]/اسم. ویشۆ؛ جـۆرێ وەرزشـی شـەڕانی وڵاتی چینـە، وەکوو کاراتە، بە بەرگی تایبەتی خۆیەوە.

**وول** / vûl/:/اسم.[گفتاری] جـم و جـوول؛ جمەجم؛ جووڵەجووڵ؛ پێچ و تاو؛ پـێچ و خـول؛ قەمچ و پێچ؛ پێچ و با.

◘ وول خـوردن/ زدن: پـێچ خـواردن؛ جـم و جووڵ‌کەردەی؛ خۆ بادان؛ جووڵەجووڵ‌کـردن ‹چقدر وول می‌خوری!: چەندە پێچ دەخوی!›.

**وه** / vah/: صوت. واخ؛ پـەیک؛ ئـەک؛ حـەک؛ دەک؛ پیەح؛ حا؛ عا؛ بـە؛ بـەخ؛ وشـەیێ کـە لـە سەیرمان، پەسندکردن یان پێ نـاخۆش بوونـدا دەیلێن.

**وهابی** / vahābî، ـها؛ ـان؛ ـون/: [عربی] *صفت.* وەهابی؛ شوێنکەوتووی وەهابیەت.

**وهابیت** / vahābîyyat/: [عربی]/اسم. وەهابیـەت؛ لقێک لە شوێنکەوتووانی تون و تیژی مەزهـەبی حەنبەلی کە لە سەدەی ۱۲ی کۆچی و لە سـەر بـیر و ڕای موحەممـەد کـوڕی عەبدولوەهابـەوە سەری هەڵدا، کە قورعان و سـونەتی پێغەمبـەر بنەڕەتی باوەڕیانە و پەنا بە غەیری خـودا بـردن بە شەریک بۆ خودا دانان دەزانن.

**وهله** / vahle/: [عربی]/اسم. ۱. جار؛ کەڕەت؛ بـار ‹وهله‌ی دومی بود که می‌دیدمش: جاری دووهەم بـوو کە دەمبـینی› ۲. پلە؛ پلـەک؛ قۆنـاغ؛ قۆنـاخ ‹در وهله‌ی اوّل باید هوشیار باشی: لە یەکـەم پلـەدا دەبێ وریا بی›.

**وهم** / vahm ، ـها؛ اوهام/: [عربی]/اسم. ۱. وەژارە؛ گومان؛ خەیاڵ؛ بیر و هزرێ کە دەگەڵ جەهانی

دەرەوەدا پێکنایە ٢. [گفتاری] ترس؛ سام؛ تەرسی ٣. خۆف؛ هەڵەتاوی؛ ترسی بێخۆ کە لە گومانەوە سەرچاوە دەگرێ.
⊡ وهم برداشتن: خۆف‌کردن؛ ترس داگرتن؛ سام داگرتن؛ تووشی شتێکی بێ‌هۆ یان بە هۆی گومانەوە بوون.
**وهنگ** / vahang ، ـها/: اسم. چاکل؛ چاکلە؛ چەمەرە؛ قەف؛ هیچک؛ هێچک؛ هەچک؛ قوڵف؛ ولەف؛ ولۆف؛ قلف؛ چەڵەم؛ چەڵەمە؛ یەچک؛ هەچەل؛ هەجی؛ ئاڵقەی سەری گوریس کە کاتی بەستنەوەی شتێک ئەو سەرەکەی لێوە دەردەکەن و دەیکێشن سفت دەبێتەوە.
**وی** / vey/: ضمیر. [ادبی] ئەو؛ هەو؛ ڤی؛ ڤێ؛ ئڤی؛ یا؛ یۆ؛ یەی؛ یی؛ هاو؛ وە؛ وی (بۆ نێر)؛ وێ (بۆ مێ)؛ ئاد (بۆ نێر)؛ ئادە (بۆ مێ)؛ جێناوی ئاماژە بۆ سێهەم کەسی تاک.
**ویار** / viyār/: اسم. بێزوو؛ وێزوو؛ بێزی؛ بێزگ؛ بێژی؛ بێژین؛ مەهبیران؛ مەجیرانی؛ مەگیرانی؛ مژن؛ مەورانی؛ مەبرانی؛ تاس؛ کەربا؛ کەرب؛ کەربایەی؛ کەربایی؛ کەروایی؛ کەروا؛ کەڤرا؛ نەوریان؛ مەوریان؛ مەهگران؛ کەوژ؛ نەبیران؛ بێز و وازی ژن لە سەرەتای زگ‌پڕیدا.
⊡ ویار کردن: بێزگ/ بێزوو/ مەگیرانی/ کەوژ کردن؛ کەرباندن؛ کەوژین؛ مژن‌کەردەی.
**ویارانە** / viyārāne ، ـها/: اسم. بێزووانە؛ بێزگانە؛ مژنانە؛ ئەو شتەی ژنی ئاوس بێزگی پێوە دەکا: **آرزوانە؛ هوسانە**
**ویاردار** / viyārdār ، ـها/: اسم. بێزگەوان؛ مەگیرانی‌کەر؛ بێزووکەر؛ ژنی ئاوس لە توفی بێزووکردندا.
**ویتامین** / vîtāmîn ، ـها/: [فرانسوی] اسم. ویتامین؛ هەر کام لە پێکهاتە ئالیەکانی نێو خۆراک یان لەشی گیانداران کە بۆ ژیان پێویستە بەلام وزەی لێ بەرهەم نایە.
⊡ ویتامین آ: ویتامین ئا؛ ڕتینۆل؛ هەر کام لەو ویتامینانەی دە نێو چەوریدا دەتوێنەوە و کەم بوونەوەیان لە لەشدا دەبێتە هۆی قەڵشان و ڕەقێڵە بەستنی پێست و شەوکوێری. لە زەردێنە، شیر و ڕۆنی جەرگی ماسیدا هەیە.
ویتامین ا: ویتامین ئی؛ ویتامینێ کە لە زاوزێ و گەورە بوونی ماسوولکەدا دەوری هەیە و ویدەچێ تا ڕادەیەک پێش بە پیر بوونی سیللول بگرێ: **ویتامین ئی**
ویتامین ئی ☜ **ویتامین اِ**
ویتامین ب ١: ویتامین بێ ١؛ تیامین؛ ویتامینی دەئاودا تواوەی بی، کە بە هۆی کەم بوونەوەی، نەخۆشی بیری ـــ بیری سەرهەڵدەدا. لە جەرگ و هێلکە و ئاوجۆدا هەیە: **ویتامین بی؛ تیامین**
ویتامین ب ٢: ویتامین بێ ٢؛ ڕیبوفلاوین؛ تێکەڵاوێکی زەردی بلۆرینە کە دەبێتە هۆی گەشەی لەش و لە شیر و جەرگدا هەیە.
ویتامین ب ٦: ویتامین بێ ٦؛ لە ویتامینەکانی دەستە بێیە کە لە سووت و سازی ئەسیدی ئامینەدا دەورێکی گرینگی هەیە و هەروەها بەر بە دڵ هەڵشێوان و ڕشانەوە دەگرێ.
ویتامین ب ١٢: ویتامین بێ ١٢؛ سیانوکومالامین؛ دارستەیەک لە کوباڵتە کە بەتایبەت دە نێو جەرگدا بۆ بەرهەم هێنانی خوێن، کاری کۆندامی دەماری و گەشەی لەش پێویستە.
ویتامین ب کمپلکس: ویتامین بێ کۆمپلکس؛ کۆمەڵەویتامینی لە ئاودا تواوە، کە لە نێو ئاوجۆی ترشاو، ناوکە، هێلکە، جەرگ، ئێسک و سەوزیدا هەیە، ئیشتیا زۆر دەکاتەوە و بۆ ساغی کۆندامی دەماری پێویستە.
ویتامین بی ☜ **ویتامین ب١**
ویتامین ث: ویتامین سێ؛ ئەسید ئاسکوربیک؛ ویتامینی لە ئاودا تواوەی سێ کە دە نێو میوە و سەوزی تازەدا هەیە و چاک بوونەوەی برین

لەز دەکا، سووت و سازی ئەسیدی ئامینە و وەرگرتنی ئاسن زۆر دەکاتەوە: **ویتامین ثی**

ویتامین ثی ☜ **ویتامین ث**

ویتامین د: ویتامین دیّ؛ ویتامینی لە چەوریدا تواوەی دیّ کە لە نێو ڕۆنی جەرگی ماسی، زەردێنەی هێلکە و شیردا هەیە و بۆ گەشە کردن و پتەو بوونی ئێسک و ددان پێویستە: **ویتامین دی**

ویتامین دی ☜ **ویتامین د**

ویتامین کا: ویتامین کا؛ ویتامینی پێویست بۆ بەرهەم هێنانی پرۆترومبین و بەرگری لە خوێنچوونە. لە زردێنەی هێلکە، تەماتە و سەبزیدا هەیە: **ویتامین کی**

ویتامین کی ☜ **ویتامین کا**

**ویتامینە** / vîtāmîne/: [فرانسوی] *صفت.* ویتامیندار؛ ویتامینە ‹شربت ویتامینە؛ شامپوی ویتامینە: شەربەتی ویتامیندار؛ شامپۆی ویتامیندار›.

**ویترای** / vîtrāy/: [فرانسوی]/*اسم.* ویترای؛ نەقاشی بە ڕەنگی هەویری یان ڕۆنی لە سەر شیشە.

**ویترین** / vîtrîn، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* ویترین: ١. پێکهاتەیەک بە دیواری شیشەییەوە بۆ ڕانانی کەلوپەلی فرۆشگا ٢. سندوقی جام؛ قاپئاوێنە؛ جابەی لە شیشە کە بە ملیەوە هەڵیدەواسن شتی وردیلەی بۆ فرۆش تێدەچنن.

**ویدئو** / vîde'o، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* ویدیۆ؛ ویدئۆ؛ دەزگای تۆمارکردن و بلاوکردنەوەی میغناتیسی دەنگ و ڕەنگ: **ویدیو**

**ویدئوکلوپ** / vîde'okulûb, -kolûb، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* ویدیوکلووب؛ دامەزراوەی کرێ دانی فیلمی ویدیۆیی.

**ویدئوکنفرانس** / vîde'okonf(e)rāns/: [؟] ☜ **دورسُخَنی**

**ویدئویی** / vîde'oyî/: [انگلیسی] *صفت.* ویدیۆیی؛ ویدئۆیی؛ پێوەندیدار یان سەر بە ویدیۆوە ‹فیلمهای ویدیویی: فیلمگەلی ویدیویی›: **ویدیویی**

**ویدیو** / vîdîyo/: [انگلیسی] ☜ **ویدئو**

**ویدیویی** / vîdîyoyî/: [انگلیسی] ☜ **ویدئویی**

**ویر** / vîr/: *اسم. [گفتاری]* وەسوەسە.

▣ ویر کسی گرفتن: کەوتنە سەری کەسێک؛ دان لە سەری کەسیّ ‹یک روز ویرش گرفت برود فرنگ: ڕۆژێک کەوتە سەری بروا بۆ فەرەنگ›.

**ویراژ** / vîrāj، ـها/: [فرانسوی]/*اسم.* ویراژ؛ چوونی پێچاوپێچ، بەتایبەت بە ماشین یان موتورسیکلێت.

▣ ویراژ دادن: ویراژ دان؛ پێچاوپێچ ڕۆشتن و لار بوونەوە بۆ چەپ و ڕاست ‹موتورسوارها توی پیادەرو از وسط جمعیت ویراژ میدهند: موتورسوارەکان لە نێو پیادەڕۆدا لە ناوەڕاستی جەماوەرەکەوە ویراژ دەدەن›.

**ویراستار** / vîrāstār، ـها؛ ـان/: *اسم.* نویسیار؛ نڤیسیار؛ ئیدیتۆر؛ کەسیّ کە بەرهەمی نووسەرانی دی هەڵەگری، ڕێکوپێک و ئامادەی چاپ دەکا.

**ویراستاری** / vîrāstārî/: *اسم.* نویسیاری؛ نڤیسیاری؛ ئیدیتۆری؛ کاری نویسیار.

**ویراستن** / vîrāstan/: *مصدر. متعدی.* ١. هەڵوەژارتن؛ هەڵوەژاردن؛ ڕێکوپێک کردنی دەقی نووسراوەیەک بۆ بلاوکردنەوە وناردن ٢. *[قدیمی]* پوویین؛ هەلاڵ کردن؛ خاراندن؛ دەباغ کردن؛ خۆشەکردنی چەرم. هەروەها: **ویراستنی**

■ صفت مفعولی: **ویراسته** (هەڵوەژارتە)

**ویران** / vîrān/: *صفت.* کاول؛ ویران؛ ڤێران؛ دێران؛ دێرس؛ کەلاریّ؛ کامباخ؛ کەمباخ؛ کایل؛ کەییل؛ قەترمە؛ کەلار؛ کەلاریّ؛ کافل: ١. بیّ بەش لە ئاوەدانی ‹دهِ ویران؛ باغ ویران: دێی کاول؛ باخی کاول› ٢. ڕووخاو؛ ڕخیاو؛ ڕمیاو؛ ڕمیاگ؛ پەشیل؛ هەرفتی؛ شنیار؛ شنیارە؛ زەمەر؛ خاپوور؛ خارخاپوور ‹خانەی ویران: خانووی

ڕووخاو›.

▣ ویـران شـدن: پەشـیلان؛ پەشـیلین؛ ڕمـین؛ هەڕفتن؛ کـاول بـوون؛ کاولـەو بـوون؛ کـاول بیەی؛ وێران بوون/ بیەی؛ تێک‌تەپین.

ویران کردن: خاپوورکردن؛ کاول‌کردن؛ وێران کردن؛ زەمەردا پوەی؛ هلسـاندن؛ ڕووخانـدن؛ ڕماندن؛ پەشیلاندن؛ کاول‌کەردەی؛ ئـاوەدانی و سامانی شوێنێک لە نێو بردن ‹دشمن شهر را ویران کرد: دوژمن شاری خاپوور کرد›. هەروەها: **ویران بودن**

**ویرانگر** / vîrāngar/: صفت. ڕووخێنەر؛ کاولکـەر؛ وێرانکەر؛ فەوتێنەر؛ هۆکار و هۆی کـاولی ‹سپاه ویرانگـر؛ زەمـین‌لـرزەی ویرانگـر: هێـزی ڕووخێنـەر؛ بوومەلەرزەی کاولکەر›.

**ویرانگـــری** / vîrāngarî/:/ اسـم. کاولکـــاری؛ وێرانکاری؛ کارەهاتی ڕووخاندن و لە ناو بردن؛ پەشیلاندن.

**ویرانـه** / vîrāne ، ـها/:/ اسم. کـەلاوە؛ کـەلاری؛ خوپان؛ خراوە؛ وێرانـە؛ شـوێنی کـاول ‹شهر بـه ویرانه‌ای تبدیل شد: شار بوو بە کەلاوەیەک›.

**ویرانـــی** / vîrānî ، ـهـا/:/ اسم. کـاولی؛ وێـرانی؛ دێرسی؛ دۆخ یان چۆنیەتی وێران بـوون ‹جنـگ ویرانی بسیار به بار آورد: شەڕ کاولی زۆری بار هێنا›.

**ویـــرایش** / vîrāyeš ، ـهـا/:/ اسـم. نقیسـیاری؛ نویسیاری؛ ئیـدیت؛ کـار و ڕەوتی هەڵـەگرتن و ونارکردنی دەقی نووسراوەیەک بـۆ بلاوکردنـەوە ‹قرآن کردی تاکنون دو بار ویرایش شده است: قورئانی بەکوردی تا ئێستا دوو جار نقیسیاری کراوە›.

**ویرگول** / vîrgûl ، ـها/: [فرانسوی]/ اسم. ویرگوول؛ کاما؛ گت؛ نیشانەیەکی وا «،» کە دوو وشە یـان دوو پاژی ڕستەیەک دیاری دەکا.

**ویروس** / vîrûs ، ـها/: [فرانسوی]/ اسم. ویـرووس؛ ڤایروس: ١. گیانداری یـەکجار وردیلـەی هـۆی زۆر نەخۆشی وەک شەپلەی منداڵان، سووریجە، پەتا، هاری و... ٢. بەرنامەیەکی کەمپیۆتری بـۆ تێکدانی کار و ڕەوتی ئاسایی کەمپیۆتر

**ویروسی** / vîrûsî/: [فرانسـوی] صفت. ویرووسـی؛ ویرووسدار یان لە ویـرووس بـەدیهاتوو ‹بیماری ویروسی: نەخۆشی ویرووسی›.

**ویری** / vîrî/: صفت. [گفتاری] سەرشێت؛ هەوکی؛ هۆکی ‹این برادر ما یک آدم ویری است، وقتی ویـرش می‌گیرد کاری بکند، کسی جلودارش نیست: ئـەم بـرای ئێمە کابرایەکی سەرشێتە، کە دای لە سەری کـارێ بکا، بۆ کەس بەری ناگیرێ›.

**ویزا** / vîzā ، ـها/: [فرانسـوی]/ اسم. ویـزا؛ بـەرایی چوونە وڵاتێک بۆ بیانیان، کە لە لایەن نوێنـەری ئەو وڵاتەوە دەدرێ.

**ویزیـت** / vîzît ، ـهـا/: [فرانسـوی]/ اسم. ویزیـت: ١. کار و ڕەوتی بینین؛ چاو پێکـەوتن؛ دیـتن و تۆژینەوەی نەخۆش بۆ زانـینی هـۆی نەخۆشـی ‹دکتر هنوز مریض‌ها را ویزیت نکـرده است: دوکتـور هێشتا نەخۆشەکانی نەبینیوە› ٢. بازاڕدۆزی؛ کار و ڕەوتی دۆزینەوەی کڕیار ‹آمده بود یخچـال ویزیـت می‌کرد: هاتبوو بۆ ویزیتـی یەخـەچاڵ› ٣. پـارەی ویزیت ‹ویزیت دکتر ده هـزار تومـان است: ویزیتـی دوکتور دە هەزار تمەنە›.

**ویزیتور** / vîzîtor ، ـها/: [فرانسوی]/ اسم. ویزیتـۆر؛ بازاڕدۆز؛ کەسێ کە پیشەی دۆزینەوەی کـڕیارە بۆ کاڵا.

**ویزیتوری** / vîzîtorî/: [فرانسوی]/ اسم. ویزیتۆری؛ بازاڕدۆزی؛ کاری دۆزینەوەی کڕیاران.

**ویزیـــدن** / vîzîdan/: مصـدر. متعـدی. [قـدیمی] دابێژان؛ دابێژتن؛ بێژان؛ بێژانن؛ بێژتن؛ بێژاندن؛ بێتن؛ وێژان؛ وێژانـدن؛ شـەرداندن؛ سـەرداندن؛ وێتەی؛ وێچنەی؛ لە بێژنگ دان.

**ویژگـــی** / vîjegî ، ـهـا/:/ اسم. تایبەتمەنـدی؛ دانستە؛ گەوشین: ١. چۆنیەتی، یـان نیشـانەی تایبەت ‹ویژگی او صرفه‌جویی در نقطـه‌گذاری است: تایبەتمەندی ئەو دەست پێوەگرتن لە خاڵبەندیدایە› ٢. دۆخ یان چۆنیەتی تایبـەتی بـوون ‹هر کس

ویژگی خودش را دارد: هەر کەس دانسنەی خۆی هەیە›.

**ویژه** / vîje/: صفت. تایبەت؛ تایوەت؛ تەیبە؛ تایبەتی؛ تاویەتی؛ تایوەتی؛ گەوشت: ١. تەرخان‌کراو بۆ شتێک ‹ویژەی بار: تایبەتی بار› ٢. بە دۆخ یان چۆنیەتیەکی تاقانە و بێ‌هاوماڵەوە ‹هواپیمای ویژه؛ وضعیت ویژه: فڕۆکەی تایبەت؛ دۆخی تایبەت›.

**ویژه‌کار** / vîjekār ، ـها؛ ـان/: اسم. تایبەت‌کار؛ ئەو کەسە لە بوارێکی زانستی یان فەننی دیاریکراودا کار دەکا.

**ویژه‌کاری** / vîjekārî/: اسم. تایبەت‌کاری؛ ڕەوتی کارکردن لە ڕشتەیەکی زانستی یان فەننی دیاریکراودا.

**ویژه‌نامه** / vîjenāme ، ـها/: اسم. تایبەت‌نامە؛ ژمارەیەک لە بەلاڤۆکێکی دەورەیی کە بۆ بابەتێکی تایبەت تەرخان‌کراوە.

**ویسکوزیته** / vîskozîte/: [فرانسوی] اسم. گرانڕۆیی؛ ویسکۆزیتە.

**ویسکی** / vîskî/: [انگلیسی] اسم. ویسکی؛ خواردنەوەیەکی ئەلکولی کە لە هەڵگەڕانەوەی تۆمی جۆ و دانەوێڵەی‌تر دروست دەبێ.

**ویشگون** / vîšgûn/ ☜ **نیشگون**

**ویکونیا** / vîkonyā ، ـها/: [؟] اسم. ویکوونیا؛ گیاندارێکی گوانداری کێوی لە تیرەی وشترە، لە کێوەکانی ئاند لە ئامریکای باشووریدا دەژی.

**ویلا** / vîlā ، ـها/: [فرانسوی] اسم. گۆم؛ ویلا: ١. خانەباخ؛ ماڵی هاوینەهەوار بە باخ یان باخچەوە ‹کنار دریا ویلا دارند: لە قەراخ دەریاوە ویلایان هەیە› ٢. ماڵی دەربەستی؛ خانووی دەربەستە؛ ماڵی بە حەوشەوە بۆ یەک بنەماڵە.

**ویلائی** / vîlā'î/: [فرانسوی] ☜ **ویلایی**

**ویلان** / veylān/: صفت. وەیلان؛ گەبەر؛ ویلوو: ١. سەرلێ‌شێواو؛ سەرگەردان؛ مشەخت؛ وەیلان ٢. ئاوارە؛ لانەواز؛ ترافیە؛ تراڤیە؛ ڕیتاڵ؛ تەرە؛ هاوی؛ هەڵوەدا؛ دەربەدەر؛ دەرەندوو؛ هەردەگێل؛ پەڕتەوازە.

**ویلان و سیلان** / veylān-o-seylān/: [فارسی/عربی] صفت. [گفتاری] ئاوارە و دەربەدەر.

**ویلانی** / veylānî/: اسم. وەیلانی؛ سەرگەردانی؛ سەر لێ شێواوی؛ دۆخ یان چۆنیەتی وەیلان بوون.

**ویلایی** / vîlāyî/: [فرانسوی] صفت. گۆمی؛ ویلایی؛ وەکوو ویلا: **ویلائی**

**ویلچر** / vîlčer ، ـها/: [انگلیسی] اسم. ویلچر؛ سەندەڵی تەگەرەدار.

**ویلن** / vîyolon ، ـها/: [فرانسوی] اسم. ویولون؛ سازێکی ژێداری چوارتاڵە کە دەنرێتە سەرشان و بە ئارشە دەژەنرێ: **ویولن؛ ویولون**

**ویلن‌آلتو** / vîyolonālto/: [فرانسوی/ از ایتالیایی] ☜ **ویولا**

**ویلن‌زن** / vîyolonzan ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] اسم. ویولون‌ژەن؛ ویولونیست؛ ژەنیاری ویولون.

**ویلن‌سل** / vîyolonsel ، ـها/: [فرانسوی] اسم. ویولون‌سێل؛ سازێکی ژێداری چوارتاڵی زۆر گەورەیە دەنرێتە سەر زەوی و بە ئارشە دەژەنرێ.

**ویلنیست** / vîyolonîst ، ـها/: [فرانسوی] اسم. ویولون‌ژەن؛ ویولونیست؛ ژەنیاری ویولون: **ویولنیست؛ ویولونیست**

**ویولا** / vîyolā ، ـها/: [ایتالیایی] اسم. ویولا؛ سازێکی ژێدارە وەکوو ویولون و هێندێ گەورەتر: **ویلن‌آلتو**

**ویولن** / vîyolon/: [فرانسوی] ☜ **ویلُن**

**ویولنیست** / vîyolonîst/: [فرانسوی] ☜ **ویلُنیست**

**ویولون** / vîyolon/: [فرانسوی] ☜ **ویلُن**

**ویولونیست** / vîyolonîst/: [فرانسوی] ☜ **ویلُنیست**

# هـ

**هـ** / h/: *حرف.* ه ؛ نیشانەی سی‌ویەکەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**هـ** / he/: *اسم.* هـ ؛ هـێ؛ ناوی سی‌ویەکەمین پیتی ئەلفوبێی فارسی ۲. *[مخفف]* ک؛ کۆچی ‹فتح مکّه در سال ۸ هـ اتفاق افتاد: گرتنی مەککە لە سالی ۸ ک ڕوویدا›.

**ـ ـە** / e/: *پسوند.* ۱. ـە؛ ناو دروست دەکا: *الف)* لە ناوێکی‌تر ‹دستە؛ کفە؛ هفتە: دەسە؛ کەفە؛ حەوتە› *ب)* ـێنە؛ ـینە؛ لە ئاوەڵناو ‹سبزە؛ سفیدە؛ خُردە: سەوزە؛ چەرمێنە؛ وردە› *ج)* لە ڕەگی کاری ڕانەبردوو (ناوی ئامراز) ‹سنبە؛ مالە: سمە؛ مالە› ۲. ـ او؛ ـ وو؛ ـ یا؛ ـە؛ لە ڕەگی کاری ڕابردوو ئاوەڵناو دروست دەکا ‹آشفتە؛ خستە: شێواو؛ ماندوو› ۳. *[گفتاری]* ـەکە؛ ـکە؛ پیتی ناسیاری؛ نیشانەی بناس ‹مَردە؛ سگە؛ آقاهە: پیاوەکە؛ سەگەکە؛ کابراکە›. ٤. ـە؛ لەگەڵ ناودا ئاوەڵناو پێک‌دێنێ ‹بهارە؛ پاییزە: بەهارە؛ پاییزە› ٥. ـە؛ لەگەڵ ڕەگی کاری ڕانەبردوودا، ناوی چاوگ پێک‌دێنێ ‹نالە؛ خندە: نالە؛ خوە› ٦. ـە؛ لە هەندێ وشەی لێکدراودا، مانای وێکچوون دەدا ‹دندانە؛ زبانە؛ شاخە: ددانە؛ زوانە؛ شاخە› ۷. ـە؛ لەگەڵ ژمارەدا، ناو پێک‌دێنێ و پیشاندەری بەشێک لە زەمانە ‹هزارە؛ سدە؛ چلە: هەزارە؛ سەدە؛ چلە›.

**ها**[1] / hā/: *اسم.* هێ؛ ناوی سی‌ویەکەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی: **های دوچشم؛ های هَوَّز**

◙ های دو چشم ☜ **ها**[1]

های هوَز ☜ **ها**[1]

**ها**[2]: *حرف. [گفتاری]* ۱. ها؛ پیتی پێداگری ‹فراموش نکنی، ها!؛ بهِش بگویی، ها!: لە بیرت نەچێ، ها!؛ پێ بێژی ها!› ۲. ها؛ هم؛ نیشانەی پرسیار ‹ها؟ چە گفتی؟: ها؟ چیت وت؟› ۳. ـانە؛ نیشانەی پێداگری (زۆرتر دەگەڵ جێناو و ناوی چاوگێ کە یای چاوگی بێ دێت) ‹بە این زودی‌ها؛ بە آن سختی‌ها هم نبود: بەم زووانە، بەو سەختیانەش نەبوو›.

**ها**[3]: *صوت. [گفتاری]* ها: ۱. ئا؛ بەڵێ؛ ئەرێ؛ ئێ ‹گفتم: آزاد! گفت: ها. وتم: ئازاد! گوتی: ها› ۲. ئا؛ بەڵێ؛ ئەرێ؛ ئێ ‹پرسیدم: می‌آیی؟ گفت: ها. پرسیم: دیت؟ گوتی: ئا› ۳. هە؛ هوو؛ دەنگێ کە بە هۆی دانە دەرەوەی هەوا لە زارەوە دروست دەبێ.

◙ ها کردن: هوو کردن؛ ها لێ‌کردن؛ دەردانی هەڵم و بۆقی دەم ‹عینک را جلو دهانش گرفت و ها کرد: چاویلکەکەی گرتە بەر زاریەوە و هووی کرد›.

**ـ ها**[4]: *پسوند.* ـان؛ ـگەل؛ ـیەل؛ ـەیل؛ ـێل؛ ـێ؛ نیشانەی کۆ ‹کوەها؛ درخت‌ها؛ سرها؛ جان‌ها: کێوان؛

دارگەل؛ سەریەل؛ گیانەیل›.

**هائل** / hā'el/: [عربی] ☜ **هایل**

**هاپچه** / hāpče/: *صوت.* هەپش؛ هەپشە؛ دەنگی پژمین.

▣ **هاپچه کردن:** *[گفتاری]* هەپش‌کردن؛ پژمین؛ پشمین.

**هاپ ـ هاپ** / hāphāp/: *صوت.* حەپە حەپ؛ حەوحەو؛ عووعوو؛ عەوعەو؛ عەف‌عەف؛ وەڕەوەڕ؛ دەنگی وەڕینی سەگ.

**هاپو** / hāpû ، ـها/: *اسم. [کودکانه]* حەوحەو؛ سەگ.

**هات‌داگ** / hātdāg ، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* ساندویچی سوسیسی داخ.

**هاتف** / hātef ، ـان/: [عربی] *اسم.* سرووش؛ سەرۆ؛ دەنگەژە.

**هاج و واج** / hāc-o-vāc/: *صفت. [گفتاری]* گێژوویج؛ گێژ و ویژ؛ هاج و واج؛ ئاژ و واژ؛ گەوشەک؛ چاش؛ شاش؛ هوول؛ واق‌وڕماو؛ ماق‌ماو؛ بەحەت؛ مات: ۱. حەیران ‹هاج و واج ماندم که چه بکنم: حەیران مابووم چ بکەم› ۲. حەپەساو؛ سەرسووڕماو؛ سەرگەردان؛ سەر لێ تێک‌چوو؛ سەرلێ‌شێواو ‹از دیدنم هاج و واج شده بود: له دیتنم حەپەسابوو›.

▣ **هاج و واج شدن:** واق‌وڕمان؛ ماق مان؛ گێج و وێج/ سەرسام/ حەیران/ هاج و واج/ ئاژ و واژ/ گەوشەک بوون؛ کلمسین؛ حەپەسان؛ سەر سووڕمان؛ بەحتەو بوون؛ سەرسام بیەی؛ سەر سەڕ بیەی.

هاج و واج کردن: کلمساندن؛ حەپەساندن؛ بەحتەوکردن.

**هادی**[1] / hādî ، ـها/: [عربی] *اسم. [ادبی]* ڕێنوێن؛ ڕێنوما؛ ڕێنما؛ ڕانما.

**هادی**[2]: *صفت.* ۱. *[برق]* ڕەسانا ۲. ڕێنما؛ ڕێنوێنی‌کەر.

**هار** / hār/: *صفت.* هار: ۱. تووشیاری نەخۆشی هاری ۲. *[مجازی]* دڕ؛ دڕندە؛ شەڕفرۆش؛ زۆر توورە و دڕ.

**هارپ** / hārp ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* هارپ؛ سازێکی ژێداری سێ‌گۆش وەک چەنگە بە قامک دەیژەنن، بەلام گەورەیە و ٤٨ یان ٥٠ تالی هەیە.

**هارت و پورت** / hārt-o-pûrt ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* قرم و قال؛ هات و هووت؛ هارت و هوورت؛ هەڕەشە و گوڕەشە؛ گوڕەگوڕ؛ شات و شووت؛ دەنگ و هەرا و هەڕەشەی بێ‌هو و بن‌شڕ ‹قدری هارت و پورت کرد، دید کسی محل نمی‌گذارد ساکت شد: هێندێ قرم و قالی کرد، کە دیتی کەس ولامی ناداتەوە بێدەنگ بوو›: **هارت و هورت؛ قارت و قورت**

**هارت‌وهورت** / hārt-o-hûrt/ ☜ **هارت و پورت**

**هارمونی** / hārmonî ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* هارمونی: ۱. *[موسیقی]* هەماهەنگی؛ هاودەنگی؛ دۆخی یەک‌گرتنەوە و دڵ‌بزوێن بوونی چەند دەنگی مووسیقایی ۲. یەکگرتوویی؛ چۆنیەتی لێک‌کالانەوەی ئەندامانی ورد و درشتی سیستەمێک.

**هارمونیک** / hārmonîk/: [فرانسوی] *صفت.* هارمونیک: ۱. *[موسیقی]* هاوساز؛ هەماهەنگ؛ هاودەنگ؛ هەڤدەنگ ۲. یەکگرتوو؛ هەڤگرتوو.

**هارمونیکا** / hārmonîkā ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* هارمونیکا؛ سازی دەمی.

**هارمونیوم** / hārmon(i)yom ، ـها/: [فرانسوی] *اسم.* هارمونیوم؛ سازێکی باژەنە کە بە دوو دەمە بای بۆ دەچێ و بە قامک دەژەنرێ.

**هاروتی** / hārûtî/: [عربی از ریشه‌ی اوستایی خرداد] *صفت. [مجازی]* هارووتی؛ ئەفسوونکار؛ جادووگەر؛ سیحرباز.

**هاری** / hārî/: *اسم.* هاری؛ درمێکی ویرووسیە لە لیکی گورگ و سەگی نەخۆشەوە تووشی مرۆ دەبێ و لە کۆندامی دەماریدا خۆ پیشان دەدا و

شەپلە و مەرگی لە دوودایە.

**هاشور** / hāšûr/: [فرانسوی] ☜ **پَرداز**[1]

**هاضمه** / hāzeme/: [عربی]/اسم. گەوارش؛ دەن؛ هەرسەک؛ ڕەوتی هەڵتاوین و دەناندنی خۆراک لە ورگدا.

**هافبک** / hāfbak ، ـهـا/: [انگلیسی]/اسم. [ورزش] هافبەک؛ هەرکام لە یاریزانانی فووتباڵ کە لە نێوان زەویدا کایە دەکەن.

**هافتایم** / hāftāym ، ـهـا/: [انگلیسی]/اسم. نیوە؛ هەرکام لە دوو نیوەی کایە.

**هافنیم** / hāfniyom/: [انگلیسی]/اسم. هافنیوم؛ توخمێکی کیمیاوی کانزاییە، بە ژمارەی ئەتۆمی ۷۲ و کێشی ئەتۆمی ۱۷۸,٤۹ کە ئالیاژی لێ بەرهەم دێنن.

**هافهافو** / hāfhāfû/ ☜ **هَفهَفو**

**هاکی** / hākî/: [انگلیسی]/اسم. [ورزش] هاکی؛ یاریەکی وەک فووتباڵ کە بە گۆپاڵ لە تۆپ هەڵدەدەن.

◙ هاکی روی یخ: هاکی سەر سەهۆڵ.

**هاگ** / hāg ، ـهـا/: اسم. [زیست‌شناسی] هاگ؛ هاگە؛ گەردە؛ توخمی میکرۆسکۆپی کە پاش لێبوونەوە لە هاگدان، ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ، تەنێکی نوێ بەدی دێنێ.

**هاگدار** / hāgdār ، ـان/: صفت. هاگدار؛ گەردەدار؛ خاوەن هاگ ‹گیاه هاگدار: گیای هاگدار›.

**هاگدان** / hāgdān ، ـهـا/: اسم. [گیاه‌شناسی] هاگدان؛ ئەندامی پێکهێنەری هاگ لە گیای بێ‌گوڵدا، کە کاری پۆپە لە گیا گوڵدارەکاندا دەکا.

**هاگ‌سازی** / hāgsāzî/: اسم. هاگ‌سازی؛ ڕەوتی پێکهاتنی هاگ.

**هال** / hāl ، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. هۆل؛ هۆڵ: ۱. هاڵ؛ دیوێ کە دەرگای ماڵی بەسەردا دەکرێتەوە و لەوێوە بۆ دیوەکانی‌تر دەچن ‹توی هال نشسته بودیم، حرف می‌زدیم: لە هاڵدا دانیشتبووین و قسەمان دەکرد› ۲. [نامتداول] سەرسەرا؛ هەیوان؛ هێوان ۳. [نامتداول] تالار؛ تەلار.

**هالتر** / halter ، ـهـا/: [فرانسوی]/اسم. [ورزش] هالتەر؛ میلەی پۆڵایی دووسەر سەنگ بۆ هەڵێنان و زۆرەزمایی.

**هالو** / hālû ، ـهـا/: صفت. [گفتاری] گیلۆکە؛ گێل؛ حۆل؛ ئەلحۆ؛ سایلۆح؛ سایلەوح؛ گەمژە؛ گەمژەل؛ گەواڵ؛ گەمشۆ؛ تەفک؛ سەپۆلە؛ سەپەل؛ حەپش؛ هۆل؛ چڵ؛ چۆپیک؛ کۆکم؛ فەحە؛ مێخۆلی؛ گەڤە؛ زار؛ بەیتەشە؛ پەخمە؛ حەپە؛ ولحە؛ مێشۆ؛ خەشیم؛ دەبەنگ؛ نەفام؛ جلخۆز؛ گەوج؛ لەوج؛ دینۆک؛ خیڤک؛ کەم‌ئاوەز.

**هالوژن** / hālojen ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] هالۆژن؛ هەرکام لە پێنج توخمی فلۆئور، کولور، بورۆم، یود و ئاستاتین کە لە ڕزنی حەوتەمی جەدوەلی مەندەلیەف و بە شێوەی مولوکوولی دوو ئەتومی لە سروشتدان.

**هالوگیر** / hālûgîr ، ـها؛ ـان/: صفت. [گفتاری] خاپینۆک ‹طرف هالوگیر قهاری است: کابرا یەکجار خاپینۆکە›.

**هاله** / hāle ، ـها/: اسم. خەرمان؛ خەرمانە؛ ئاخڵ؛ ئاخڵە؛ جۆخینە؛ جووخینکە: ۱. مژی دەوری مانگ، خۆر و هەسارەی ڕاخووشاو ۲. کەمەی ڕووناکایی لە دەوری شتێک.

**هالی** / hālî/: [انگلیسی]/اسم. هالی؛ هەسارەی ڕاخووشاوی کۆمەڵەی ڕۆژ کە هەر سوورێکی ۷٦ ساڵ دەخایەنێ.

**هامش** / hāmeš/: [عربی]/اسم. پەراوێز؛ پەڕاوێز؛ سپیایی دەوراندەوری لاپەڕەی کتێب.

**هامون** / hāmûn ، ـهـا/: اسم. ۱. کرک؛ یازی؛ یازوو؛ لەیلان؛ دەشت؛ قەلاچ؛ قەراج؛ گەڕ؛ سفتیک؛ زەوینی تەختانی پان و بەرینی بێ‌بەرزی و نزمی ۲. چۆڵگە؛ بیاوان؛ قاقڕ؛

دەشتی بێ‌ئاو و گیا.

**هان** / hān/: *صوت.* ها؛ ئەرێ: ١. *[ادبی]* هۆ؛ کورە؛ هەی؛ ئەی؛ ئۆ؛ نهێ؛ ئا؛ دا؛ وا ‹هان ای مردم! بپاخیزید!: هۆ خەلکینە! ڕاپەڕن!› ٢. ئا؛ ئێ؛ بەرێ؛ بەڵێ ‹هان، این شد: ها، ئاوا دەبێ›.

**هاورکرافت** / hāverk(e)raft، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* هاڤرکرافت؛ کەرستەیەکی گواستنەوەی موتوری کە لە بان ڕفێدەیەکەوە بە سەر زەوی و ئاودا دەڕوا: **هەواناو**

**هاون** / hāvan، ـها/: [عربی] *اسم.* ئاوان؛ ئاونگ؛ هاونگ؛ هاوان؛ ئاوانە؛ هاڤن؛ هەوەنگ؛ هەونیگ؛ هەڤان؛ دنگ؛ دینگ؛ جون؛ جۆنی؛ جوون؛ جڕان؛ جەبل؛ تەقن؛ دەفری گرۆڤەری قووڵ لە برنجە یان بەردینە کە شتی تێدا (بە دەستەی ئاوان) دەکوتنەوە و دەیهاڕن: **هَوَنگ** *[گفتاری]*

**هایل** / hāyel/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* بەسام؛ سامدار؛ سامناک؛ زەندەقبەر؛ بەهەیبەت؛ خۆفناک؛ هۆڵناک؛ تۆقێنەر؛ ترسێنەر؛ ترسناک؛ مەترسی‌دار: **هائل**

**های‌وهوی** / hāy-o-hûy، ـها/: *اسم.* هەرا ـ هەرا؛ هەرا و هوریا؛ زەنا ـ زەنا: ١. شەماتە؛ زڵە؛ دەنگ و دۆڕ؛ قرموقاڵ؛ هەرمەلە؛ گرموهۆڕ؛ گرموقاڵ؛ قیرەقیر؛ دەنگ و هەرا ٢. *[مجازی]* ئاژاوە؛ بشێوە؛ ئاشۆ؛ هێو؛ گۆبەند؛ گاشە.

**های ـ های** / hāyhāy/: *صوت.* زوڕ ـ زوڕ؛ دەنگی بەرزی گریان ‹های ـ های گریه می‌کرد: زوڕ ــ زوڕ دەگریا›.

**هبد** / habad/: *اسم.* *[قدیمی]* خێشک؛ ماڵە؛ تەختەی ڕێک و لووس‌کردنی شێوەرد.

**هبوط** / hubût, hobût/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* کار یان ڕەوتی داهاتن؛ دابەزین؛ داوەزین؛ هاتنە خوار؛ ئامایرە وار؛ وار ئامەیش.

**هبک** / habak, habk/: *اسم.* *[قدیمی]* لەپ؛ بەری دەست؛ ناو دەس/ مشت.

**هبه** / hebe/: [عربی] *اسم.* بەخشش؛ بەخششت؛ کاری بەخشینەوە؛ بەخشین؛ بەشین.

**هپ** / hop/: *صوت.* *[گفتاری]* ١. هۆپ؛ ڕاوەستە؛ وشک ‹هپ! داری می‌خوری به دیوار: ڕاوەستە! خەریکی لە دیوارەکە دەدەی› ٢. وس؛ وست؛ کڕ؛ کپ؛ داکڕ؛ وش؛ وسکوت؛ بێدەنگ بە ‹هپ! دیگر بس کن!: وس! ئیدی بەسە›.

**هپاتیت** / hepātît/: [فرانسوی] *اسم.* *[پزشکی]* هیپاتیت؛ هەوکردن و ئاییسانی جەرگ.

**هپاتین** / hepātîn/: [فرانسوی] ☜ **گلیکُوژن**

**هپارین** / hepārîn/: [؟] *اسم.* *[شیمی]* هیپارین؛ ماکێکی ئەسیدی ـ قەندی سولفووردارە گرسانی خوێن وەپاش دەخات.

**هپتان** / heptān، ـها/: [انگلیسی] *اسم.* *[شیمی]* هێپتان؛ تراوی هیدروکەربونی بێ‌ڕەنگ کە لە نەوتدا هەیە و لە بژیشکی و پیشەسازیدا بەکەڵکە.

**هپرو** / haparû/: *اسم.* *[گفتاری]* کار و ڕەوتی پڕ پێدا کردن؛ ڕفاندن؛ دابڕسکان؛ دابڕسکین.

**هپروت** / haparût/: [عربی بە قیاس جبروت و ملکوت] *اسم.* *[گفتاری]* حەپەرووت؛ خەوەزینگ؛ بێ‌خەبەری و بێ‌خەیالی ‹بعد از آنکه تریاکش را کشید و نشئه شد، رفت به عالم هپروت: پاش ئەوەی تریاکەکەی کیشا و نەشە بوو کەوتە عالەمی حەپەرووت›.

**هپلی** / hapalî/: *صفت.* *[گفتاری]* ١. پیس و پۆخڵ؛ خاوەن سەر و بەرگێکی پیس و شپرز و دوور لە ڕەوشتی کۆمەڵگا ٢. ئەلحەو؛ ولحێ؛ پەخمە.

**هپلی‌هپو** / hapalîhapo/: *صفت.* *[گفتاری]* حەپلی‌حەپاو: ١. شپرز؛ ڕیپاڵ ٢. شێواو؛ بێ سەرە و بەرە.

▣ هپلی‌هپو کردن: کردنە حەپلی‌حەپاو؛ هەڵمەقووت‌کردن؛ داگیرکردن؛ تەپ دانە سەر ماڵی کەسێک.

**هتاک** / hattāk ، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* دەمپیس؛ جنێوفرۆش؛ جوێنفرۆش؛ جنێودەر؛ دژوێنفرۆش؛ دژمانوەش؛ دژماندەر.

**هتاکی** / hattakî/: [عربی]*اسم.* *[ادبی]* دەمپیسی؛ جنێوفرۆشی؛ جوێنفرۆشی؛ کارەڕەهاتی جنێو دان؛ سکانن؛ سکاندن ‹قدری هتاکی کرد و رفت: هێندێک دەمپیسی کرد و لێیدا ڕۆی›.

**هتک** / hatk/: [عربی]*اسم.* *[ادبی]* ئەتک؛ هەتک: ۱. کارەڕەهاتی دڕین؛ دڕاندن؛ شڕکردن ۲. کارەساتی لەناو بردن؛ زیانگەیاندن ‹هتک حرمت؛ هتک ناموس: ئەتکی حورمەت؛ هەتکی نامووس›.

⊡ هتک خود را پاره کردن: *[تعریض، گفتاری]* ۱. زگ خۆ دڕین؛ زۆر تووڕە بوون ۲. خۆ خواردنەوە؛ خۆ ئازار دان.

**هتل** / hotel ، ـها/: [فرانسوی]*اسم.* هوتیل؛ میوانخانە؛ مێمانخانە؛ دامەزراوەیەکی جێ و ڕێدار بۆ شەو خەوتن و حەواندنەوەی مشتەریان.

**هتلداری** / hoteldārî ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] *اسم.* هوتیلداری: ۱. زانست و کارامەیی بەڕێوە بردنی هوتیل ۲. کاری خاوەن یان بەرپرسی هوتیل. هەروەها: **هتلدار**

**هجا** / hecā ، ـها/: [عربی]*اسم.* ۱. برگە؛ بەش؛ بچووکترین یەکەی زمانی وتاری دوای فونیم کە لە فارسیدا بریتیە لە پیتێکی کپ و بزوێنێک (وەک «با»)، یان دوو کپ و بزوێنێک لە نێوانیاندا (وەک «بار») یا سێ کپ و بزوێنێک لە بەین دوو کپی سەرەتادا (وەک «سرد») ۲. کارەڕەهاتی بێئابڕووکردن؛ داشۆڕان؛ هەجوکردن ۳. هەجو؛ فڕ؛ فراوێژی.

**هجائی** / hecā'î/: [عربی] ☜ **هجایی**

**هجایی** / hecāyî/: [عربی] *صفت.* ۱. برگەیی؛ برگە- برگە؛ پێوەندیدار یان سەر بە برگەوە ‹شعر هجایی: شیعری برگەیی› ۲. فراوێژانە ❋ **هجائی**

**هجده** / hecdah/: *اسم.* هەژدە؛ هەجدە؛ ژمارەی سەرەکی پاش هەفدە و پێش نۆزدە: **هیجده**

**هجده**[2] : *صفت.* هەژدە؛ هەجدە: ۱. یەکێک زۆرتر لە حەڤدە دانە ۲. هەژدەهەم؛ هەژدەیەم ❋ **هیجده**

**هجدهم** / hecdahom/: *صفت.* هەژدەهەم؛ هەژدەیەم؛ هەجدەهەم؛ بە ڕیز، پلە یان پێگەی هەژدەهەمەوە.

**هجدهمی** / hecdahomî/: *ضمیر.* هەژدەهەمی؛ هەژدەیەمی؛ لە ڕیز، پلە یان پێگەی هەژدەهەمیدا.

**هجدهمین** / hecdahomîn/: *صفت.* هەژدەهەمین؛ هەجدەهەمین؛ بە ڕیز، پلە و پێگەی هەژدەهەمەوە.

**هجر** / hecr/: [عربی]*اسم.* دووری؛ دوورکەوتوویی؛ لێکهەڵبڕاوی.

**هجران** / hecrān/: [عربی]*اسم.* دووری؛ هەڤدووری؛ لێکهەڵبڕاوی؛ لێکبڕاوی.

**هجرت** / hecrat/: [عربی]*اسم.* هیجرەت: ۱. *[ادبی]* کۆچ؛ ڕەو؛ دۆخ یا ڕەوتی دوورکەوتنەوە لە زێد ۲. کۆچی پێغەمبەری ئیسلام لە مەککەوە بۆ مەدینە کە سەرەتای مێژووی کۆچیە.

**هجری** / hecrî/: [عربی]*اسم.* کۆچی؛ سالپێوی وڵاتە ئیسلامیەکان کە سەرەتای، کۆچی پێغەمبەرە لە مەککەوە بۆ مەدینە.

⊡ هجری شمسی: کۆچی هەتاوی؛ ساڵپێوی کۆچی بە پێی ڕۆژئەژمێری هەتاوی. هەروەها: **هجری قَمَری**

**هجمه** / hacme/: [عربی]*اسم.* *[نامتداول]* پەلامار؛ شالاو؛ هێرش؛ تەک؛ هەڵمەت؛ گورمژ؛ وروژم؛ هرووژم؛ هاژۆت؛ گالا؛ نهێو.

**هجو** / hacv ، ـها/: [عربی]*اسم.* فڕ؛ کەترە؛ زەم؛ هەجو؛ کارەڕەهاتی خراپە وتن؛ داشۆڕدن؛ جنێوی بە شیعر یان پەخشان.

▣ هجو کردن: داشۆردن؛ داشتن؛ نووسراوەیەک لە خراپە وتنی کەس یان شتێکدا.

**هجو**[2]: *صفت. [گفتاری]* دزێو؛ نەچێ؛ کرێت؛ ناحەز؛ ناشیرین ‹این کارهای هجو چیست کە تو می‌کنی؟: ئەم کارە دزێوانە چیە دەیکەی؟›.

**هجوم** / hucûm, hocûm ، ـها/: [عربی]/*اسم.* هەڵمەت؛ پەلامار؛ پەلەمار؛ پەلامارە؛ شالاو؛ هێرش؛ خریچ؛ هاشاوڵ؛ گالا؛ گورمژ؛ گلپ؛ نهێو؛ هاوڵ؛ وروژم؛ هروژم؛ هورووژم؛ گوژم؛ هاژۆت؛ هوترە ‹هجوم آب؛ هجوم مردم؛ هجوم دشمن: شالاوی ئاو؛ هێرشی خەڵک؛ پەلاماری دوژمن›.

▣ هجوم آوردن: پەلامار دان؛ هەلا بردن؛ هێرش هێنان؛ هەڵکوتانە سەر؛ مل پێوە نان؛ هورووژم هێنان؛ هورووژم‌کردن؛ شالاو هێنان؛ پەلەمار دەی. هەروەها: **هجوم بردن**

**هجونامە** / hacvnāme ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* کەترەنامە؛ نووسراوەیەک بۆ داشۆردنی کەس یان کەسانێ: **هجویە**

**هجویە** / hacvîyye/: [عربی/ فارسی] ☜ **هجونامە**

**هجی** / heccî/: [از عربی]/*اسم.* حونجی؛ حینجە؛ حونجە؛ هینجێ؛ گوتنی بڕگەبەبڕگەی وشە یان وشەیەک.

▣ هجی کردن: حونجی‌کردن؛ هینجێ‌کەردەی؛ خوێندنەوەی بە سەر و بۆرەوە.

**هچل** / hačal/: *اسم. [گفتاری]* گێچەڵ؛ گێچەڵە؛ پەتەر؛ رووشە.

▣ بە/ تو(ی) هچل افتادن: *[گفتاری]* تووشی گێچەڵ بوون؛ کەفتنە گێچەڵ؛ تووشی رووشە هاتن؛ تووشیاری دەردیسەر و گیر و گرفت بوون ‹توی شهر غریب بە هچل افتادم، نە پول داشتم نە زبان می‌دانستم: لە شاری غەریبدا تووشی گێچەڵ بووم، نە پارەم بوو نە زمانم دەزانی›.

هەروەها: **بە/ تو(ی) هچل انداختن**

**هدایا** / hadāyā/: [عربی] جمعِ ☜ **هدیە**

**هدایت** / hedāyat ، ـها/: [عربی]/*اسم.* ١. رێنوێنی؛ رێنومایی؛ رێنمایی؛ رانمایی ٢. کاری بەڕێوە بردن ‹هدایت اتومبیل: بەڕێوە بردنی ماشێن›. هەروەها: **هدایت شدن؛ هدایت کردن**

**هدبند** / hedband ، ـها/: [انگلیسی/ فارسی]/*اسم.* تەوێڵ‌پێچ؛ سەربەن؛ تیزماڵکی دەوری سەر بۆ جوانی یان پاراستن.

**هدر** / hadar/: [عربی] *صفت.* ١. فێڕۆ؛ هەدەر؛ هەرز؛ خەسار؛ کیس؛ هەڕش؛ کیسی؛ زەرەر ٢. بێ‌هۆ.

▣ هدر بودن: فێڕۆ بوون؛ بێ‌خۆ بوون؛ قازانج نەبوون؛ بەکەڵک نەبوون؛ بێ‌هۆ بوون؛ بێ‌کەڵک بوون ‹هر کاری کردم هدر بود و آخر سر خانە از دستم رفت: هەر کارێکم کرد فێڕۆ بوو، ئاخری ماڵەکەم لە دەست چوو›.

هدر دادن/ کردن: لە کیس دان؛ بەتلاندن؛ وندا کردن؛ حەڕماندن؛ بە خەسار دان؛ فەوتاندن؛ بە فێڕۆ دان؛ بە فێڕۆ دای ‹آن همە پول را هدر دادم: ئەو هەمووو پارەیەم لە کیس دا›.

هدر رفتن/ شدن: بە فێڕۆ چوون؛ بە خەسار چوون؛ لە کیس چوون؛ کیس چین؛ حەڕمین؛ حەرام گەڕان/ گەڕیان ‹هم پولم هدر رفت، هم وقتم: هەم پارەم بە فێڕۆ چوو، هەم کاتم›.

**هدف** / hadaf ، ـها؛ أهداف/: [عربی]/*اسم.* ئامانج؛ ئارمانج: ١. نیشانە؛ نیشانێ؛ نیشا؛ کێلک؛ بەرتیر؛ بەرپێک ‹زدی بە هدف: دات لە نیشانە› ٢. مەبەست ‹هدف شما از این کار چیست؟: ئامانجتان لەم کارە چیە؟› ٣. مەبەست؛ دۆز؛ بەرگ؛ مەرام؛ کاربەند؛ ئەوەی هەوڵی بۆ دەدەن تا دەستی بخەن ‹هدف زندگی: ئامانجی ژیان›.

▣ هدف قرار دادن/ گرفتن: گرتنە/ کردنە نیشان؛ گێرتەی نیشانێ ‹پیشانی مرا هدف قرار داد: تەوێڵمی کردە نیشان›.

بە هدف خوردن: پێکران؛ ڤەترکان؛ پیکیەی؛

لێدران؛ ئەنگێوران؛ ئەنگوتران؛ لێ کەوتن؛ بەرکەوتن؛ هەنگێوران.
به هدف رسیدن: بە ئامانج / مەبەست گەیین.
بە هدف زدن: *[گفتاری]* پێکان؛ پێکەی: ۱. ئەنگووتن؛ ئەنگوتن؛ لێدان؛ پێکتەی؛ ڤەترکاندن؛ نیشانێ هۆرگێرتەی ۲. *[مجازی]* بە مەبەستی سەرەکی ئاماژەکردن.
**هدف‌گیری** / hadafgîrî ، ـها/: [عربی/ فارسی] */اسم.* نیشانەگیری؛ کار و ڕەوتی لێگرتن؛ نیشانەگرتن؛ بەرەو نیشانە گرتن.
**هدفمند** / hadafmand/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ئامانجدار؛ دۆزدار؛ بە ئامانجێکی دیاریکراوەوە ‹رفتار هدفمند؛ فعالیت هدفمند: ئاکاری ئامانجدار؛ چالاکی ئامانجدار›.
**هدفن** / hedfon/: [انگلیسی] ☜ **دوگوشی**
**هدنرس** / hedners ، ـها/: [انگلیسی]/*اسم.* سەرپەرستار.
**هدهد** / hodhod ، ـها؛ ـان/: [عربی]/*اسم.* ۱. هەپوو؛ پەپوو؛ هەپووک؛ پەپووسێمانە؛ پەپووسلێمانە؛ پەپووسلێمانکە؛ پەپووسلێمانی؛ پەپووسلەمانکە؛ پاپی‌سلێموونی؛ بووبووکەرە؛ داودیڕۆنکل؛ داودکیلەونکل؛ کەوکەل؛ کوکەل؛ شانەوەسەر؛ باڵندەیەک بە ئەندازەی کۆتر بە دندووکی باریک و زۆر بەقەوت و سەری چکۆلەوە کە تاجێکی لە سەرە.
**هدیه** / hedye, had(i)ye ، ـها؛ هدایا/: [عربی]/*اسم.* دیاری؛ دەسایز؛ پێشکەشی؛ زەنگولنە؛ هەدیە؛ ئەوەی بۆ خۆشحاڵ کردنی کەسێک یان بۆ ڕێزلێنانی پێی دەدرێ ‹عید نوروز پدربزرگ یک ساعت به من هدیه داد: جێژنی نەورۆز باوەگەورە سەعاتێکی بە دیاری پێدام›.
**هذیان** / haz(i)yān ، ـها/: [عربی]/*اسم.* وڕاوە؛ وڕاوێ؛ ڤراڤە؛ وڕێنە؛ وەرێنە؛ وڕینە؛ ئاتەران؛ ڕاوان؛ هۆڕاوە؛ لافە؛ ڕاوێ؛ هەپلە؛ هەڵپەلە؛ هەلەـپەلە؛ خوتە؛ گلتە؛ غلتە؛ غلت؛ هوڕێنە: ۱. جۆرێ هەڵشێوانی بیر و هۆش وێڕای قسەی بێ مانا ۲. هاتەران‌پاتەران؛ هەڵیت‌وپەڵیت؛ قسەی مفت و بێ‌مانا.
⊡ هذیان گفتن: ڕاواندن؛ وڕاوەکردن؛ وڕاوەی؛ وڕاوای: ۱. قسە پەڕاندن؛ بە هۆی نەخۆشیەوە قسە ڕاواندن ۲. *[تعریض]* وڕ لێدان؛ وڕکەوڕک کردن؛ فلتاندن؛ قسەی هەڵیت‌وپەڵیت‌کردن.
**هذیان‌گویی** / haz(i)yāngûyî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/*اسم.* فشار؛ شپەستە؛ کار و ڕەوتی ڕاواندن؛ وڕاوەکردن؛ وڕاوای.
**هر** / har/: *صفت.* هەموو؛ هەر؛ گشت؛ گش؛ هەچ؛ هۆر؛ بریتی لە هەموو ئەندامانی کۆمەڵێک ‹هر روز می‌رفتند؛ هر کسی می‌توانست ببیند: هەموو ڕۆژێ دەڕۆیشتن؛ کەس کەسێ دەیتوانی ببینێ›.
⊡ هر دو پا را در یک کفش کردن: *[مجازی]* پێ لە زەوی چەقاندن؛ چوون بە چەقی لەعنەتدا؛ پێ‌داگرتن؛ پاداگردن؛ ڕک‌کردن لە سەر کارێک؛ سوور بوون لە کارێکدا.
**هرآینه** / harāyene/: *قید.* بێ‌سۆ؛ بێ‌شک؛ ئەڵبەت؛ بێ‌گومان؛ نەیسە.
**هرازچندی** / harazčandî/: *قید.* جاروبارە؛ جار و بار؛ جارەوجار؛ جارەجار؛ جاربەجار؛ هەرچەند جار؛ بەیناوبەین؛ بەین ـ بەین؛ کات‌نەکات؛ گا و بێگا ‹هر از چندی او را می‌دیدم: جاروبارە دەمدیت›: **هرازگاهی**
**هرازگاهی** / harazgāhî/ ☜ **هرازچندی**
**هراس** / harās/: */اسم. [ادبی]* خۆف؛ سام؛ هەراس؛ هەراسە؛ باک؛ دڵەخورپێ؛ هەیبەت؛ مەترسی؛ جەفل ‹هراس از دزد؛ هراس از بلندی: خوف لە دز؛ سام لە بەرزایی›.
**هراس‌آور** / harāsāvar/: *صفت.* خۆفناک؛ سامناک؛ هۆی ترسی زۆر ‹صحنەی هراس‌آور: دیمەنی خوفناک›.
**هراسان**[1] / harāsān/: *صفت.* تۆقیو؛ تۆقیاگ؛ زۆر ترساو ‹دیروز که دیدمش، سخت هراسان بود: دوێنێ

که چاوم پیٚ‌کەوت، تەواو ترسیبوو›.

**هراسان**[2]: *قید.* بە ترس و لەرزەوە؛ ترسەترس؛ لەرزەلەرز ‹هراسان آمد: بە ترس و لەرزەوە هات›.

**هراساندن** / harāsāndan/: *مصدر. متعدی. [ادبی]* // **هراساندی**: تۆقاندت؛ **می هراسانی**: دەتۆقێنی؛ **بهراسان**: بتۆقێنە// تۆقاندن؛ تۆقنەی؛ تۆقنای؛ بەهتاندن؛ بزدهاندن؛ فەرهاندن؛ قورفاندن؛ جڤراندن؛ داچماندن؛ هەژڤاندن؛ زۆر ترساندن: **هراسانیدن**

■ صفت فاعلی: **هراساننده** (تۆقێنەر)/ صفت مفعولی: **هراسانده** (تۆقێنراو)/ مصدر منفی: **نَهراساندن** (نەتۆقاندن)

**هراس‌انگیز** / harāsangîz/: *صفت.* خۆفناک؛ سامناک؛ زاتبەر؛ پیاوتۆقێن؛ ترس‌بزوێن ‹داستان هراس‌انگیز: چیرۆکی خۆفناک›.

**هراسانیدن** / harāsānîdan/ ☜ **هراساندن**

**هراسناک** / harāsnāk/: *صفت.* سامناک؛ خۆفناک؛ زەرندی؛ گرتۆلە؛ چاڤسۆر؛ چاوسوور؛ زاتبەر ‹قیافەی هراسناک: سەر و سیمای سامناک›.

**هراسیدن** / harāsîdan/: *مصدر. لازم. [ادبی]* // **هراسیدی**: تۆقای؛ **می هراسی**: دەتۆقی؛ **بهراس**: بتۆقە// تۆقان؛ ترسیان؛ تۆقیان؛ تۆقەی؛ تۆقای؛ تەرسەی؛ ترسان؛ بەهتین؛ بزدان؛ بزدهان؛ بزدەهان؛ فەرهان؛ فەرهین؛ جەفلین؛ زۆر ترسیان. هەروەها: **هراسیدنی**

■ صفت فاعلی: **هراسنده** (ـــ)/ صفت مفعولی: **هراسیده** (تۆقاو)/ مصدر منفی: **نَهراسیدن** (نەتۆقان)

**هراسیده** / harāsîde، ـگان/: *صفت. [ادبی]* تۆقاو؛ تۆقیاگ ‹سیمای هراسیده: دیمەنی تۆقاو›.

**هرای** / har(r)āy/: *اسم. [ادبی]* هێرە؛ هەرا؛ گاڵ؛ قاڵ؛ نەرە؛ هورە؛ نەعرەتە؛ دەنگی بە قەو.

**هرت** / hort/: *صوت.* قلم؛ لووشکە؛ لووشە؛ چلپە؛ قۆرە؛ دەنگی خواردنەوە: **هورت**

⊡ هرت کشیدن: هەڵقوڕاندن؛ هەڵقوڕان؛ هەڵلووشین؛ هۆرلووشتەی؛ هۆرقوڕنەی؛ لووشکەکردن؛ چای یان خواردنەوەیەکی تر نیانە سەرەوە و دەنگ لە زارەوە دەرهاوردن ‹سوپ را آن طور هرت نکش!: چێشتەکە وا هەڵمەقوڕینە!›.

**هرتز** / hrtz/: [آلمانی] ☜ **هِرتس**

**هرتس** / herts/: [آلمانی] *اسم.* هێرتس؛ هێرتز؛ یەکەی لەرینەوە، بەرامبەر بە ژمارەی دەور لە چرکەیەکدا.

**هرجائی** / harcā'î/ ☜ **هرجایی**

**هرجایی** / harcāyî، ـها/: *اسم.* بڤکێ؛ بەستۆک؛ جندە؛ سۆزمانی؛ سۆزانی: **هرجائی**

**هرج و مرج** / harc-o-marc، ـها/: [عربی] *اسم.* بشێوە: ۱. ئاژاوە؛ خارۆرە؛ گۆتاڵ؛ گاشە؛ هەرا؛ کەتن؛ ئاشۆ؛ ئاڵۆزی؛ گۆتاوەڕۆ؛ شێواشێو؛ شێوانشێو؛ تێکەولێکە؛ ئاخوران‌باخوران؛ بێ‌سەروبەرەیی؛ ڕۆمەڵخەزا؛ پاشاگەردانی؛ کەس‌ناکەسی؛ کەس‌لەکەسی ‹در شهر هرج‌ومرج بود: لە نێو شاردا ئاژاوە بوو› ۲. شپرزی؛ شێواوی؛ تێکەڵ‌پێکەڵی ‹کارها دچار هرج و مرج شد: کارەکان تووشی شپرزی بوون›.

**هرج‌ومرج‌طلب** / harc-o-marctalab، ـها؛ ـان/: [عربی] *صفت.* ئاژاوەگێڕ؛ ئاژاوەچی؛ بشێوەخواز؛ گاشەکار؛ کەتن‌گێڕ؛ خاوەن خوو و خدە یان ئۆگرەتی بە ئاژاوە نانەوە. هەروەها: **هرج‌ومرج‌طلبی**

**هرچند** / harčand/: *حرف.* باوجوو؛ ئەگەرچی؛ ئەرچی؛ هەرچی؛ هەچی؛ هەچ؛ هەڤقاس؛ هرچقاش؛ هەرچقاس؛ سەتکا؛ هندیکو؛ ئەوەند؛ حەرچی؛ هنگی؛ هندی؛ هەرچەندە؛ هەرچەند؛ چەندبەچەند؛ هەرچەن ‹او رفت، هرچند اصلاً دلش نمی‌خواست برود: (ئەو) ڕۆیشت، ئەگەرچی هیچ پێی خۆش نەبوو بڕوا›.

**هرچه** / harče/: *قید.* هەرچێک؛ هەرچیٚ؛ هەرچی؛ هەرچێک؛ هەچ: ۱. هەر شتیٚ؛ هەر چتیٚ؛ هەر شتێک؛ هەر چیە؛ ئەوەی؛ ئانە؛ هەر

چشت؛ هەر تشت؛ هەر چێیێو ‹هرچه می‌خواست بُـرد: هـەرچیکی دەویست بـردی› ٢. هەرچـەن؛ هەرچەند؛ هەرچەندە؛ هەرچـەنێک؛ هەرچنگـە؛ هەرچەنگ؛ هەر ئەنازە؛ هەر ئەنگازە ‹هرچه بیشتر، بهتر: هەرچی زۆرتر، باشتر› ٣. چی؛ ئەوەی؛ ئانـە؛ هەرگوجی؛ هەرشتێ ‹هرچه داشتم گم شـد: جـیم هەبوو گوم بوو›.

**هردمبیل** / hardambîl/: [فارسـی/ ترکـی] *صـفت. [گفتـاری]* ١. بـێ‌سـەرە و بـەرە؛ تێکەولێکـە؛ تێکەـلێکە؛ هەرکە بۆ خۆی ‹اینجا چقـدر هردمبیـل است!: ئێرە چەند بێ سەرە و بەرەیە!› ٢. تاوتـاوی؛ ڕاـ ڕا؛ بێ‌بارە؛ بێ‌بەر و پشتە ‹او هردمبیـل اسـت و نمی‌شود رویش حساب کرد: ئەو ڕاـ ڕایە و حیسابی لـە سەر ناکرێ›.

**هـردم‌جـوش** / hardamcûš/: *صـفت. [گفتـاری]* خوێڕی؛ خۆڕی؛ هیچ‌وپووچ.

**هردود** / hordûd/: *اسم. [گفتاری]* قوولە؛ نەعرەتە؛ گوڕە؛ هەرای کاتی هەڵمەت بردن.

◘ هـردود کشـیدن: قوولـەکردن: ١. نەعرەتـە پێکـان/ پێکـەی؛ گوڕانـدن؛ بـە هـاوارەوە هەڵمەت بردن ٢. *[گفتاری]* پێکەوە بە دەنگ و هەرای زۆر، سەر کردنە شوێنێکدا.

**هــــرروزه**[1] / har.rûze/: *صــفت.* هـــەمووڕۆژە؛ هەرڕۆژە؛ گش‌ڕۆژە؛ گرڕۆیـە ‹ایـن کـار هـرروزه‌ی اوست: ئەمە کاری هەمووڕۆژەیە›.

**هــرروزه**[2]: *قیـد.* هـەموو ڕۆژێ؛ هـەر ڕۆژ؛ گـش ڕۆژێ؛ هـەرچی ڕۆژە؛ گـرۆژێ؛ گـرویـو؛ گـرد رویو؛ هەرچی ڕۆینێ؛ هـەرچی ڕوینـێ؛ هـەموو ڕۆژێ؛ گش ڕۆژێ ‹هر روزه می‌آمد، پولی می‌گرفت و می‌رفت: هەموو ڕۆژێ دەهات، پوولـێکی دەسـتاند و دەڕۆی›.

**هرز** / harz/: صفت. هەرز: ١. خەسار؛ فیڕۆ؛ زایە؛ بە هیچێ چووگ؛ بێ‌خۆ؛ بێ‌کەڵک ‹آب دارد هـرز می‌رود: ئاوەکە خەریکە خەسـار دەچـێ› ٢. سـواو؛ هەرس؛ لە میـزان‌کـەوتوو ‹پیچ هـرز شـده اسـت: پێچەکـە هـەرز بـووە› ٣. هـەرزە؛ بێـوەری لـە پاراستن و پێڕاگەیشتن ‹علف هرز؛ هرز بـار آمـدن: گیای هەرز؛ هەرزە بار هاتن›.

◘ هرز بار آمدن: *[مجازی]* هـەرز(ە) بـار هـاتن؛ بەبێ سەرپەرشتی و پێڕاگەیشتن گەورە بوون.

هرز رفتن: خەسار چوون؛ هـەرز بـوون؛ زایـە بوون؛ بە فیڕۆ چوون؛ لە کیس چوون.

هرز شدن: هەرز بوون؛ سوان؛ هـەرس بـوون؛ لە میزان کەوتن.

هرز کردن: هەرزکردن؛ میزان شێواندن و لـە کار خستن (لەمەڕ پێچ، فەنەر و شتی‌واوە).

**هرزاب** / harzāb ، ـها/: *اسم.* پاشـاراو؛ پاشـەراو؛ بەراو؛ ئاوی باران، پلووسک، سـەرڕێژ و شـتی وا کە بەفیڕۆ دەچێ.

**هرزابـرو** / harzābrow ، ـهـا/: *اسم.* جۆگەلـە؛ جۆکە؛ جۆلە؛ جۆگەی ئاو.

**هرزگـــی** / harzegî ، ـهـا/: *اسم.* بـەرەلایی؛ گەللایی؛ جلفی؛ جلفبازی؛ بێ‌گەڤـی؛ پرتـوکی؛ لاساری؛ هەرزەکاری ‹آن شب توی عروسی خیلی هرزگـی کـرد: ئـەو شـەوە لـەو زەماوەنـدەدا زۆری بەرەلایی کرد›.

**هــرزه** / harze ، ـهـا/: *صفت.* خونـک؛ جلـف؛ سـووک؛ سـۆک؛ سـووک‌وچـرووک؛ هـەرزە؛ جیوەلـەک؛ هـیچ‌وپـووچ: ١. بـەرەلا؛ ئەڵـوات؛ کەڵـەش؛ قـەلاش؛ یـارەمـەز؛ یارمبـاز؛ شـنوف؛ لابرپای؛ هەرچی و پـەرچی؛ کـۆتی؛ سـەربەردە ‹مرد هرزه؛ زن هـرزه: پیـاوی ئەڵـوات؛ ژنی بـەرەلا› ٢. ناشیرین؛ دوور لە شەرم و ئـەدەب ‹حرفهـای هرزه؛ رفتار هرزه: قسەی سووک؛ کردەوەی جلف›.

**هرزه‌پا** / harzepā ، ـهـا/: *صفت. [گفتـاری]* وێـڵ؛ بەرەلا؛ بەرەللا؛ وێڵەکی؛ خوێڕی؛ خۆڕی؛ زڕتی؛ بەتاڵ‌پا.

**هرزه‌درائی** / harzedarā'î/ ☜ **هرزه‌درایی**

**هــرزه‌درایـــی** / harzedarāyî ، ـهـا/: *اسم.* دەم‌بـــەرەلایی؛ قســـەقۆڕی؛ مفـــت‌بێـــژی؛

گەوجانەڕیسی؛ هەرزەوێژی: **هرزەدرائی**

**هرزەسنگ** / harzesang/ ☜ **نخاله ـ٣**

**هرزەگرد** / harzegard ، ـها؛ ـان/: *صفت.* ١. وێڵ؛ بەرەڵا؛ خوێڕی؛ زڕتی؛ قرپۆ؛ وێڵگەرد؛ وێڵـەکی؛ وێڵکی؛ بەتاڵ‌پا ٢. *[مکانیک]* چەرخی هەرزگەڕ.

**هرزەگو** / harzegû ، ـها؛ ـیان/: *صفت.* دەم‌بەرەڵا؛ قسەقۆڕکەر؛ مفت‌بێژ؛ دردوک؛ قسە مفت‌کـەر؛ هـەرزەوێژ؛ دەمشـڕ؛ دەمپلیـت. هـەروەها: **هرزەگویی**

**هرزەنگاری** / harzenegārî ، ـها/: *اسم.* ١. کاری کێشان، تۆمار کردن و لە چاپ دانی وێنە و فیلمی جینسی، بۆ بزواندنی هۆک ٢. بەرهەمی (وەک کتێب، گۆڤار و...) کاری وا: **پورنوگرافی**

**هرس** / haras/: *اسم.* هەڵـپیت؛ ڕۆپـل؛ شخەڵ؛ شیخەڵ؛ شفتیک؛ کی‌زاخە؛ سەرگۆز؛ هـەرەس؛ وژین؛ قرپ؛ بەترۆمە؛ بە ترمـە؛ پـەرتوان؛ کـزخ؛ کەزاخ؛ کەزاخە؛ کساخ؛ کەسخ؛ پاسـار؛ تـەراف؛ داپاچ؛ کـاری قرتانـدن و سـەرگوڵ و سـەر لـق کردنی پەل‌وپۆی دار و گیا.

▣ **هرس کـردن**: هەڵـپەرتاوتن؛ هەڵـپەرداوتن؛ هەڵپاچین؛ داپاچین؛ پەنجنین؛ هەڵپەڕداوتن؛ هەڵقاچین؛ هۆرپاتەی؛ پـەرتاوتن؛ ڕۆپلانـدن؛ هەڵپیتاندن؛ ڕپلانـدن؛ خەسـاندن؛ خەسـانن؛ کزخـان؛ کزخانـدن؛ کەزخانـدن؛ کـەزاختن؛ کەسـخاندن؛ داپـیتن؛ هەڵـپاچان؛ قرپانـدن؛ ڤـەپژرنین؛ کەزاخـەکردن؛ پاسـارکردن؛ گل‌کەردش؛ پـەل‌کـردن؛ سـەرلک پەڕانـدن؛ ڕێک و جوان کـردنی دار و دەون بـە بـڕینی لق‌وپۆی زیادی.

**هرسالە**[1] / harsāle/: *صفت.* سـاڵانە؛ هەرسـاڵ؛ هەرساڵە؛ هی هەر ساڵ ‹مالیات هرساله را سر موقع مـی‌پرداخـت: پیتـاکی سـاڵانەی لـە وەخـتی خۆیـدا دەدا›.

**هرسالە**[2]: *قید.* هەموو ساڵێ؛ هـەر سـاڵ؛ هـەموو ساڵ؛ هەموو ساڵێک؛ گشت ساڵێ؛ گش ساڵـێ؛ هەرچی ساڵە؛ گرد ساڵ؛ گرد ساڵێوە؛ گـساڵـێ ‹هرساله باید مالیات بدهد: هەموو ساڵی دەبێ پیتـاک بدا›: **همه‌ساله**

**هرکارە** / harkāre/: *اسم.* دنگ؛ دینگ؛ دەفـری بەردینە.

**هرکی ـ هرکی** / harkîharkî/: *صفت. [گفتاری]* گورگوتـاو؛ کـەس‌لـەکـەس؛ پشـێوی و ئـاژاوە؛ کەس‌ـکـەس؛ کـەس‌کەسـانێ؛ هەرکـەبۆخۆی؛ هەرکە ـ هەرکە؛ هەرکی ـ هەرکی؛ بـێ‌سـەرە و بەرە؛ شپرز و بێ قانوون.

**هرگاه** / hargāh/: *قید.* هـەرکاتێ؛ هـەرکاتێک؛ هــەرکات؛ هــەروەخت؛ هــەردەم؛ هــەرئان؛ هەردەمێ؛ هەرتم؛ هەرساتێ؛ هەرسات؛ هـەرگا؛ هــەرگاو؛ هــەر گـاڤ؛ هــەر کـەی؛ هـەرعان؛ هـەرچاخێ؛ کـەنگێنێ؛ کـەنگێن؛ هـەرزەمانێک ‹هرگاه پول لازم داشتی، به من بگو: هەرکاتێ پـارەت پێویست بوو، پێم بڵێ›.

**هرگز** / hargez/: *قید. [ادبی]* قەت؛ قەد؛ هەرگیز؛ ژبنی؛ بە هیچ ئارا؛ بە هیچ جۆر؛ بە هیچ کلۆجێ؛ بە هیچ کولونجێ؛ چجـار؛ هـیچ‌گـا؛ هـیچ‌کـات؛ لەبن؛ ئەسڵەن؛ هیچ‌کاتـێ ‹هرگز او را ندیـده بـود: قەت نەیدیبوو›.

**هرم** / heram ، ـها؛ أهرام/: [عربی] *اسم.* ١. *[هندسه]* سێ‌پاڵوو؛ شکڵێکی بۆشـایی چـەن لا کـە هـەر لایەکی سێ‌گۆشـێکە و سـەرەکانیان دەگاتـەوە یەک ٢. هیرەم؛ بینایەکی گەورەی لە بەرد، بـە چـوار دیـواری سـێ‌گـۆش کـە سـەرەکانیان دەگاتەوە یەک و پتر لە میسردا دەبینرێ.

▣ **هـرم قـدرت**: *[مجـازی]* پلـەی دەسـەڵات؛ زنجیرەی دەسەڵاتی سیاسی لە کۆمەڵگایەکدا.

**هرم** / horm/: *اسم.* هاڵاو؛ هەڵـم؛ هیـت؛ تـینی گـەرمای زۆر بـە تـەوژم کـە لـە شـتێکەوە هەڵدەستێ ‹هرم آتش: هاڵاوی ئاگر›.

**هرمافرودیـت** / hermāf(e)rodît ، ـهـا/: [فرانسوی] *صفت. [زیست‌شناسی]* نێرما؛ نێرەمـا؛

دووجینسی.

**هرمن** / hormon/: [فرانسوی] ☜ **هورمۆن**

**هرمنوتیک** / hermenotîk/: [فرانسوی] /اسم. هێرمۆنتیک؛ ڕاژەی دەق؛ شێوەی شرۆڤە، ورد کردنەوە و لێکدانەوەی دەقێک.

**هرمی** / heramî/: [عربی] صفت. سێ پاڵوو: ١. بە شکڵی سێ پاڵوو ‹ساختمان هرمی: خانووبەرەی سێ پاڵوو› ٢. سەر بە سێ پاڵوو ‹هرمی شکل: سێ پاڵوو شکڵ›.

**هرنج** / haranc ، ـها/: اسم. سەر کارێز؛ چاوکەی کارێز.

**هروئین** / hero'în/: [فرانسوی] /اسم. گەرد؛ هیرۆئین؛ ماکی سڕکەری بەرهەمهاتوو لە مورفین کە مرۆ زۆر پیس هۆکارەی دەبێ.

**هروقت** / harvaqt/: [فارسی/ عربی] قید. هەرکاتێ؛ هەرکاتێک؛ هەردەمێ؛ هەر وەخت؛ هەروەختێ؛ هەرکات؛ هەرگایێ؛ هەرسات؛ هەرساتێ؛ هەر دەم؛ هەرگا؛ هەرگاف؛ هەرچاخ: ١. لە هەموو کاتێکدا ‹هروقت می‌دیدمش، لبخند به لب داشت: هەرکاتێ دەمبینی، بزەیەک بەسەر لێویەوە بوو› ٢. لە کاتێکدا؛ کاتێ؛ لەو کاتەدا ‹هروقت او را دیدی، سلام مرا برسان: هەرکاتێک چاوت پێ کەوت سلاومی پێ بگەیێنە›.

**هروله** / harvale/: [عربی] /اسم. گورگەلۆقە؛ گورگەلۆق؛ لۆق؛ قۆرتە؛ لۆقە؛ قەترە؛ قۆتە؛ قەترەسەیە؛ لۆترە؛ غاری ناتەواو؛ شتێک لە نێوان بەڕێوە چوون و غاردانا.

⊡ هروله رفتن: لەپین؛ گورگەلۆقەکردن؛ لۆقاندن؛ لۆقانن؛ لۆق/ لۆقەکردن؛ لۆقەلۆق کردن؛ قەترەسەیە ڕۆیشتن؛ بە قۆرتە ڕۆیشتن.

**هروی** / heravî/: [عربی] صفت. هەراتی؛ هێرەوی؛ پێوەندیدار یان سەر بە شاری هەرات لە ئەفغانستاندا.

**هره** / her(r)e ، ـها/: اسم. [معماری] هێرە؛ ڕیزە خشتی دەرپەڕیو لە قەدپاڵی دیوار و گوێسواندا.

**هرـ هر** / herher/: صوت. تریقەتریق؛ ترێقەترێق؛ حیلکەحیلک؛ پریق‌وحۆر؛ قاقا؛ لیقەلیق؛ فیلەفیل؛ هارەهاڕ؛ دەنگی پێکەنین.

**هرهری مذهب** / horhorîmazhab ، ـها/: [فارسی/ عربی] صفت. ١. لادین؛ لامەزەب؛ گوێنەدەر بە داب و دەستووری شەرع ٢. بێدین؛ بێئائین؛ بەبێ بڕوا ئایینێکی تایبەت.

**هره ـ کره** / herrekerre/: اسم. [تعریض، گفتاری] قلەقل؛ تریق و هۆڕ؛ هنگ؛ دەنگی بەرزی پێکەنین. هەروەها: **هره ـ کره کردن**

**هری** / herrî/: صوت. [گفتاری] هەڕێ؛ هێڕێ؛ دەرەوە؛ یاڵلاکێشە؛ وتەیەک بە مانا گومبە ‹من که برایت کارت دعوت نفرستادم، هری!: من خۆ کارتی داوەتم بۆت نەناردبوو، هەڕێ!›.

**هری** / horrî/: قید. لەپڕ؛ لەپڕا؛ لەنکاو؛ لەپڕتا؛ لە ناکاو؛ کوت‌وپڕ؛ یەکڕا؛ یەکەشە؛ یەکهەو؛ یەکەو ‹دلم هری فروریخت: لەپڕا دڵم داکەوت›.

**هریسه** / harîse/ ☜ **هلیم**

**هزار**[1] / hezār/: اسم. ١. هەزار؛ هزار؛ هازار؛ دەچەلان سەت؛ ژمارەی سەرەکی پاش لە نۆسەد و نەوەد و نۆ و پێش لە هەزار و یەک ٢. [گفتاری] قەران؛ قران؛ ڕیاڵ ‹دو هزار: دوو قران›.

**هزار**[2]: صفت. هەزار: ١. یەکێک زۆرتر لە نوسەد و نەوەد و نۆ دانە ٢. هەزارەم.

**هزاربرگ** / hezārbarg ، ـها؛ ـان/: اسم. ١. ناوی گشتی چەن جۆر گیای نێو زەلکاوانە ٢. کووزەڵە؛ گیای خۆڕسکی بەر ئاو و کانی.

⊡ هزاربرگ آبی: کووزەڵەی کانی؛ گیایەکی زەلکاوی خۆڕسکی گوڵ سپی مەیلەو پەمەیی یان بنەوشە.

**هزاربیشه** / hezārbîše/: اسم. هەزارپیشە؛ هەزاربیشە؛ جۆری سندۆقی چاوە ـ چاوە بۆ جێی کەلپەلی کار یان تۆشەی سەفەر: **هزارپیشه**

**هزارپا** / hezārpā ، ـها؛ ـیان/: اسم. زیلۆ؛ زیڤزیڤ؛

زیڤزیڤه؛ زیڤه؛ زیڤ؛ زۆڤ؛ شەمار؛ شـەحرمەحر؛ خشخشـۆک؛ پرپـە؛ کشـک؛ خشـک؛ خشـکە؛ خشگ؛ خشـی؛ مـارەزیو؛ زیـور؛ گوەسـم؛ پـرپا؛ هەزارپا؛ هەزارپێ؛ کرمێکی درێژی گرێ ـ گـرێ، کە لە هەر گرێیکەوە یەک یـان دوو جـووت پـا بۆتەوە.

**هزارپیشه** / hezārpîše/ ☜ **هزاربیشه**

**هزارتــــو** / hezārtû/: صــفت. پێچـــەلانپێچ؛ پێچەلپێچ؛ دالان ـ دالان؛ جەوەل ـ جـەوەل؛ بـە شێوەی پێچاوپێچ و توو دەر توووەو.

**هزارچشــم** / hezārčešm ، ـهـا؛ ـان/: اسم. ١. گوڵەبا؛ قلینچە هەورێشە؛ گیایەکی خزۆکـی گەلا خڕی گوڵپەمەیی یان بنەوشە لـە شـوێنی شێدار دەڕوێ ٢. چڵ‌چاو؛ دارچکێکی جەنگەڵی گەلاورکەیە چاوەـــچاوە دەنوێنـێ و زگەشـۆرە دەگیرسێنێ: **هوفاریقون**

**هزاردستان** / hezārdastān/: اسم. [ادبی] بولبول؛ بولبول؛ بلبل؛ بیلبیل؛ واف؛ سەرخوونک.

**هزارگان** / hezārgān/: اسم. ١. جمعِ ☜ **هزاره** ٢. چـوارەمین پلـەی ژمـارەی سـەرەکی، دوای یەکان و دەیان و سەتان.

**هزارلا** / hezārlā/: اسم. هەزارپەرتی؛ هەزارپرتی؛ هەزارلۆخانــە؛ هــەزارلوێ؛ لوخانــە؛ کلاوقــازی؛ هەزرلۆغانە؛ هــەزارتوێخ؛ هــەزارلۆ؛ هــەزارپیتک؛ هەزارتوێ؛ شیلافە؛ شیلاوگ؛ شیلاوک؛ شـیلک؛ گاگ؛ گادگ؛ بەشـی سـێهەمی ورگـی ئاژەڵـی کاوێژکەر، کە دیواری ناوەوەی توێ ـ توێیە.

**هزارم** / hezārom/: صفت. هەزارەم؛ بە ڕیز و پلە و پایەی هەزارەوە.

**هزارمی** / hezāromî/: ضمیر. هەزارەمی؛ ئەوەی کە لە جێگای هەزارمدایە.

**هزارمین** / hezāromîn/: صفت. هەزارەمین؛ بـە ڕیز و پلە و پایەی هەزارەمەوە.

**هزاره** / hezāre ، ـها/: اسم. هەزارە: ١. کۆمەڵێکی هــەزار دانــە ٢. ڕێوڕەسمێـــک بـــە بۆنـــەی هــەزارەمین ساڵــەهاتی ڕووداوێــک ٣. مــەودای کــاتی هــەزار ساڵــە ‹هزارەی اول پـیش از مـیلاد: هەزارەی یەکەمی پێش لە زایین› ٤. ☜ **اِزاره**

**هـــزاری** [١] / hezārî ، ـهـــا/: اســم. [گفتــاری] هەزارتمەنی؛ هەزاری؛ ئەسکەناسی هەزار تمەنی (١٠٠٠٠ ڕیالـــی) ‹لطفـاً هـــزاری بـــدە!: تکایـــە هەزارتمەنی بدە!›.

**هـزاری** [٢]: صفت. هــەزاری؛ بـە هەزاردانـە یـان بەرامبەر بە هەزار دانە لە شتێک ‹اسکناس هزاری: ئەسکەناسی هەزاری›.

**هــزاری** [٣]: قیـد. هــەزارێک؛ هــەزارێ؛ هــەزارێو؛ هەزاریە؛ هەر هەزار دانە لە شتێک ‹هـزاری صد تومان فروخت: هەزارێکی دا بە سەد تمەن›.

**هزال** / hazzāl ، ـان/: [عربی] صفت. [ادبی] شـۆخ؛ شـۆخی‌بـاز؛ قسـەخۆش؛ گاڵـتەباز؛ گاڵـتەچی؛ گاڵتەکەر؛ حەنەکچی؛ لێبۆکی.

**هزل** / hazl/: [عربی] اسم. جەفـەنگ؛ حەنـەک؛ داستان، شیعر یان نووسراوەی گاڵـتە و قسـەی خۆش.

**هزلیات** / hazlîyyāt/: [عربی] اسم. جەفـەنگیات؛ گاڵتەجاڕ؛ کۆمەڵە نووسراوەیەکی پێکەنینی.

**هـــزوارش** / hozvāreš ، ـهـا/: اسـم. [قـدیمی] هوزوارش؛ هەرکام لە وشەگەڵی ئـارامی کـە بـە خـەتی پەهلـەوی دەنووسـران و بـە فارسـی دەخوێندرانەوە (وەک بە زمانی ئارامی دەیاننوسی: لەیلا «laylā»، دەیانخوێندەوە: شـەب «šab» یـان دەیاننوسی: مەلکە «malka» دەیانخوێندەوە: شاهـ «šāh»).

**هزیمــت** / hazîmat ، ـهـا/: [عربـی] اسم. [ادبـی] تێشکاوی؛ تێک‌شکاوی؛ شکس؛ شکست؛ ترۆقە؛ کار و ڕەوتی ورە بەردان لە شەڕدا.

▣ هزیمت کردن: تێشکان؛ تێک‌شکان؛ ترۆقان؛ ترۆقیان؛ هەلاتن؛ دەرچوون؛ ڕاکردن؛ پەکین؛ بەرشیەی؛ ورە بەردان: **هزیمت دادن**

هزیمـــت دادن: تێـک‌شـکاندن؛ شـکاندن؛

شکانن؛ بەزاندن؛ ترۆقانن؛ پەکاندن؛ بەزنەی؛ بەزنای؛ شکست پێدان؛ تۆپ دان؛ تارنیەی.

**هزینه** / hazîne ، ـها/: *اسم.* خەرج؛ مەزاخ؛ مەزاخت؛ مەزخ؛ مەزیخ؛ مەزێخ؛ پارەیەک کە بۆ کارێک خەرج دەکرێ ‹هزینەی زندگی: خەرجی ژیان›.

▣ **هزینه کردن**: ١. خەرجکردن؛ پارە دان بۆ سەندنی شتێک یا جێبەجێ بوونی کارێک ٢. بۆ دانان؛ لە دەس دانی شتێ یان بەسەردا هاتنی کارەساتێک لە بایی گەیشتن بە ئامانجێک.

**هزینه یابی** / hazîneyābî/: *اسم.* بەراوەردکاری؛ بەراورد؛ کار و ڕەوتی هەڵسەنگاندن و بژاردنی خەرجی کارێک.

**هژمونی** / hejemonî/: [فرانسوی] *اسم. [سیاست]* هەڤیازی؛ پێشتری؛ سەرتری؛ دەسەڵات و دەسچوویی زۆرتری وڵاتێک لە چاو وڵاتانیتر.

**هسبند** / hasband/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* گیرۆدە؛ تووشیار؛ گرفتار. هەروەها: **هسبند شدن؛ هسبند کردن**

**هست**[1] / hast/: *اسم.* دۆخ و چۆنیەتی بوون؛ هەبوون ‹هست و نیست: بوون و نەبوون›.

▣ **هست شدن**: بەدیهاتن؛ وەدیهاتن؛ پێک هاتن؛ پەیا بوون؛ پەیدا بوون؛ درووس بوون؛ بیەی؛ وەش بیەی.

**هست**[2]: *فعل. [دستور]* هەیە؛ هەس؛ هە؛ ها؛ هەسە؛ هەن؛ هەنە؛ سێهەم کەسی تاک لە کرداری بوون.

**هستک** / hastak ، ـها/: *اسم. [زیستشناسی]* ناوکۆکە؛ ناوکەی زۆر بچووک دە نێو ناوکی خانەدا.

**هست و نیست** / hast-o-nîst/: *اسم.* بوون و نەبوون؛ دار و نەدار؛ هەس و نس؛ هەست و نست؛ هەس و نیس؛ هەستی و نیستی؛ خایە و مایە؛ بیە و نەبیە؛ هەموو دارایی و ماڵ و سامان ‹همەی هست و نیست من این خانه است: بوون و نەبوونم ئەم ماڵەیە›.

**هسته** / haste ، ـها/: *اسم.* ناوک؛ نێوک: ١. *[گیاهشناسی]* ناو؛ ناوکە؛ جنچک؛ چنچک؛ پێشە؛ هەستوو؛ دەنکی میوە ٢. *[مجازی]* ناوەڕۆک؛ ناواخن؛ ناوناخن؛ ناوئاخن ‹هستەی داستان را بگو: ناوەڕوکی داستانەکە بێژە› ٣. ناوکەی ئەتۆم؛ بەشی ناوەندی ئەتوم کە باری موسبەتە و لە پرۆتون و نوترون پێکهاتووە ٤. کاکڵ؛ کاکڵە؛ مەژگە؛ ناوەندی هەر شتێک ٥. *[زیستشناسی]* ناوکە؛ ناوە؛ ناوەندی خڕۆکەی سیللوول ٦. ناوەند؛ پچووکترین بەشی ڕێخراوەیەک ‹هستەی تحقیقاتی: ناوەندی تۆژینەوە›.

**هستەای** / haste'î/: *صفت.* ناوکی؛ ناڤۆکی؛ ناوکەیی؛ سەر بە ناوکی ئەتومەوە.

**هستهگیر** / hastegîr ، ـها/: *اسم.* ناوکەگر؛ ئامرازێک بۆ دەرهێنانی ناوکی مێوە.

**هستی** / hastî/: *اسم.* هەستی: ١. بوون؛ هەبوون ‹هستی و نیستی: بوون و نەبوون› ٢. ژیوار؛ زیوار؛ ژین؛ ژی؛ ژیوەی ‹جهان هستی: جەهانی ژیوار› ٣. *[مجازی]* ماڵ و سامان؛ دارایی ‹همەی هستیاش را آتش زدند: هەموو ماڵ و سامانیان ئاور دا› ٤. هەموو عالەم.

**هستیشناسی** / hastîšenāsî/ ☜ **بودشناسی**

**هسر** / hasar/: *اسم.* زوقم؛ تەڕایی باران کە لە سەرمادا ڕچابێ.

**هش** / hoš/: *صوت.* هۆش؛ وۆش؛ شۆش؛ چۆش؛ چوش؛ وەش؛ شش؛ هۆکش؛ وشەی دەنگدانی چارەوا بۆ وێستان.

**هشت**[1] / hašt/: *اسم.* هەشت؛ هەیشت؛ ژمارەی سەرەکی لە حەوت زۆرتر و لە نۆ کەمتر.

▣ **هشت کسی گرو نهش بودن**: *[مجازی، گفتاری]* شەشی کەسێک لە گرەو بێشدا بوون؛ هەشتی کەسێ لە گرۆی نۆیدا بوون؛ بۆخۆی پیادە و ڕزقی سوار بوون؛ داهاتی کەسێ کەم

و خەرجی زۆر بوون.

**هشت**[2]: *صفت*. هەشت؛ هەیشت: ١. یەکێک زۆرتر لە حەوت ‹هست کتاب: هەشت کتێب› ٢. هەشتەم ‹ردیف هست: ڕیزی هەشت›.

**هشت ـ**[3]: *پیشواژە*. هەشت ـ ؛ هەیشت ـ ؛ خاوەن هەشت دانە لە شتێک ‹هست‌پا: هەشتپا›.

**هشتاد**[1] / haštād/: *اسم*. هەشتا؛ هەشتێ؛ هەشتاد؛ هەیشتا؛ هشتا؛ هەیشتای؛ ژمارەی سەرەکی پاش حەفتا و نۆ و پێش هەشتاویەک.

**هشتاد**[2]: *صفت*. ١. هەشتا؛ یەکێک زۆرتر لە حەفتا و نۆ ٢. هەشتاهەم؛ هەشتایەم.

**هشتادم** / haštādom/: *صفت*. هەشتاهەم؛ هەشتایەم؛ بە ڕیز، پلە و جێگەی هەشتاوە.

**هشتادمی** / haštādomî/: *ضمیر*. هەشتاهەمی؛ هەشتایەمی؛ هەشتادەمی؛ ئەوەی لە پلە و ڕیز و پێگەی هەشتادەمدایە.

**هشتادمین**/ haštādomîn/: *صفت*. هەشتاهەمین؛ هەشتایەمین؛ هەشتاین؛ هەشتامین؛ هەیشتاین؛ هەشتادەمین؛ بە ڕیز، پلە و پایەی هەشتادەمەوە.

**هشتپا** / haštpā ، ـها؛ ـیان/: *اسم*. هەشتپا؛ هەشت‌پێ؛ جلە؛ ئوختاپووس.

**هشتصد**[1] / haš(t)sad/: *اسم*. هەشتسەد؛ هەشسەد؛ هەشسەت؛ ژمارەی سەرەکی پاش حەوسەدونەوەدونۆ، پێش هەشتسەدویەک.

**هشتصد**[2]: *صفت*. هەشتسەد؛ هەشسەد؛ هەشسەت: ١. یەکێک زۆرتر لە حەوسەدونەوەد و نۆ ٢. هەشسەدەم.

**هشتصدم** / haš(t)sadom/: *صفت*. هەشسەدەم؛ بە ڕیز، پلە و پایەی هەشتسەدەوە.

**هشتصدمی** / haš(t)sadomî/: *ضمیر*. هەشسەدەمی؛ ئەوەی لە پلەی هەشسەدەمدایە.

**هشتصدمین** / haš(t)sadomîn/: *صفت*. هەشتسەدەمین؛ هەشسەدەمین؛ لە ڕیز، پلە و جێگای هەشسەدەمدا.

**هشتم** / haštom/: *صفت*. هەشتەم؛ هەشتم؛ هەشتن؛ هەیشتن؛ هەشتنە؛ بە ڕیز، پلە و جێگای هەشتەوە.

**هشتمی** / haštomî ، ـها/: *ضمیر*. هەشتەمی؛ هەشتەم؛ ئەوەی لە ڕیز، پلە و جێگای هەشتەمدایە.

**هشتمین** / haštomîn/: *صفت*. هەشتەمین؛ هەشتەمی؛ لە ڕیز، پلە و جێگای هەشتەمدا.

**هشتن** / heštan/: *مصدر. متعدی. [قدیمی]* ١. نان؛ نیان؛ نیەی؛ دانان ٢. هێشتنەوە؛ هێلانەوە؛ ئاستەیوە ٣. *[ادبی]* بەجێ هێشتن؛ هشتن؛ هێلان؛ هلیان؛ بەجێ هێلان؛ هلیاندن؛ واز چنە ئاردەی؛ دەسبەردار بوون ‹جهان را هشتن و رفتن: دنیا بەجێ هێشتن و چوون›. هەروەها: **هشتنی**

**هشت و مشت** / hašt-o-mošt/: *صفت. [گفتاری]* ئاوقە؛ ئاوقا؛ لێک‌گیر؛ تێک‌گیر؛ تووش؛ تووشیار.

▣ هشت و مشت شدن: ئاوقەو بوون؛ دەرگیر بوون؛ ئاوقا/ ئاوقە/ تووش/ تووشیار بوون؛ لێک‌گیران؛ تێک‌گیران.

**هشتی** / haštî ، ـها/: *اسم*. هەشتی؛ دالانی هەشت‌پاڵوو.

**هشدار** / hošdār ، ـها/: *اسم*. ئاگاداری؛ کارێک بۆ ئاگادارکردنەوەی خەڵک لەمەڕ هەبوونی مەترسی ‹به شما هشدار داده بودم: ئاگاداریم پێتان دابوو›.

▣ هشدار دادن: ڕاگەیاندن؛ هەدا دان؛ ئاگاداری دان.

**هشلهف** / hašalhaf/: *صفت. [گفتاری]* تێکەڵ ـ پێکەڵ؛ تێکەولێکە؛ شێواو؛ شپرز؛ بێ‌سەرە و بەرە ‹یک جای هشلهف و بی در و پیکری بود که سگ صاحبش را نمی‌شناخت: شوێنێکی تێکەڵ ـ پێکەڵی بێ خاوەن بوو، سەگ ساحیبی خۆی نەدەناسی›.

**هشیار** / hošyār ، ـان/: *صفت*. وریا؛ هۆشیار؛ وشیار؛ شیت؛ هەشار: ١. ئاگادار؛ هاگادار؛ بە

ئاگا؛ ئەغیار؛ بەیار؛ خاوەن بیر و هۆش ۲. */ادبی/* دڵزیندوو؛ دلاوەدان؛ بزێو؛ باهۆش؛ بە هۆش؛ چراخ.

◘ هشیار شدن: گوێ زرینگیان؛ گوێ زرینگانەوە؛ هاتنە(وە) سەر خۆ؛ هۆشیار/ وریا/ ئاگادار/ بەیار/ بێدار بوونەوە. هەروەها: **هشیار کردن**

**هشیاری** / hošyārî/: */اسم/* وریایی؛ بزێوی؛ بەیاری؛ بێداری؛ وشیاری؛ هۆشیاری؛ هوشیاری؛ ئەغیاری؛ ئاگاداری؛ چارچەشی؛ چارچاقی: ۱. توانایی وەرگرتن و تێگەیشتن لەوی هەستی پێ بکرێ. بەرانبەر: **بیهوشی** ۲. */ادبی/* دڵزیندوویی؛ چراخی.

**هضم** / hazm/: [عربی] */اسم/* هەرسەک؛ هەزم؛ دەن؛ کار و ڕەوتی گڤێرین؛ دەناندن؛ هەڵتاوینی خۆراک لە ورگ و ڕیخۆڵەدا.

◘ هضم کردن: ۱. هەڵتاواندن؛ دەناندن؛ گڤیراندن؛ مهاندن؛ گڤێرین؛ بگاردن؛ هەزم کردن ۲. */مجازی/* تێگەیین؛ تێگەیشتن؛ فامین؛ فامان؛ فام‌کردن؛ قووت چوون؛ قووت دان. هەروەها: **هضم شدن**

**هفت**[1] / haft/: */اسم/* حەوت؛ حەفت؛ هەفت؛ حەو؛ هۆت؛ ژمارەی سەرەکی دوای شەش و بەر لە هەشت.

◘ هفت پادشاه را به خواب دیدن: */مجازی/* ورچەخەو کردن؛ لە قوولایی خەودا بوون.

هفت قلم آرایش کردن: */مجازی/* دیوی جوانی وەدەرخستن؛ سووراو و سپیاوکردن.

هفت کفن پوساندن: */مجازی/* سەت کەفەن دڕین؛ ئێسکیش ڕزین؛ پێشەش پرتووکان؛ لەمێژەوە مردن ‹او حالا هفت کفن پوسانده است: ئەو ئێستا سەت کەفەنی دڕیوە›.

از هفت دولت آزاد بودن: */مجازی/* لە حەوت دەوڵەتەوە ئازاد بوون؛ بەبێ هیچ بەرگرە و ئەرکێک بوون.

در هفت آسمان یک ستاره نداشتن: */مجازی/* ئارد بێژان و کەپەک مان؛ ڕۆژڕەش بوون؛ بێ‌ناوچاو بوون؛ بێ هەسارە بوون؛ زۆر هەژار و بێ‌ناز بوون ‹خانه‌اش کجا بود، او در هفت آسمان یک ستاره ندارد: ماڵی لە کوێ بوو، ئاردی بێژاوە و کەپەکی ماوە›.

**هفت**[2]: *صفت.* حەوت؛ حەفت؛ حەف: ۱. یەکێک زۆرتر لە شەش دانە ‹هفت کتاب: حەوت کتێب› ۲. حەوتەم؛ حەفتەم ‹طبقه‌ی هفت: نهۆمی حەوتەم› ۳. خاوەن حەوت دانە لە شتێک ‹هفت‌سین: حەفت‌سین›.

◘ هفت‌پشت: حەوت‌پشت؛ حەفت‌پشت؛ حەوت‌پشتی؛ تا باپیری حەوتەم ‹من هفت‌پشت او را می‌شناسم: ئەمن حەوت‌پشتی دەناسم›.

**هفتاد**[1] / haftād/: */اسم/* حەفتا؛ حەفتێ؛ حەوتا؛ هاوتای؛ هەفتێ؛ هۆوتای؛ ژمارەی سەرەکی پاش شەست‌ونۆ، پێش حەفتاویەک.

**هفتاد**[2]: *صفت.* حەفتا: ۱. یەکێک زۆرتر لە شەست‌ونۆ ۲. حەفتاهەم؛ حەفتایەم.

**هفتادم** / haftādom/: *صفت.* حەفتاهەم؛ حەفتایەم؛ حەفتادەم؛ بە ڕیز و پلە و پایەی حەفتاوە.

**هفتادمی** / haftādomî/: *ضمیر.* حەفتامین؛ حەفتادەمین؛ لە پلە و جێگای حەفتادەمدا.

**هفتادمین** / haftādomîn/: *صفت.* حەفتامین؛ هەوتاین؛ حەفتادەمین؛ بە ڕیز، ڕزن، پلە یان جێگای حەفتاهەمەوە.

**هفت‌اقلیم** / hafteqlîm, -'eqlîm/: [فارسی/ معرب] */اسم/* */کنایی/* چوارقوڕنە؛ سەرانسەری جیهان.

**هفت‌امامی** / haftemāmî, -'emāmî/: [فارسی/ عربی] ☜ **اسماعیلی**

**هفت‌اورنگ** / haftowrang, -'o:rang/: */اسم/* */نجوم/* حەوتەوانە؛ حەوتەوانان؛ لە وێنە ئاسمانیەکانی ورچ لە نیوەگۆی باکووریدا.

◙ هفت‌اورنگ کهین ☜ خرس کوچک، **خرس**

هفت‌اورنگ مهین ☜ خرس بزرگ، **خرس**

**هفت‌بند** / haftband ، ـها/: *اسم*. ١. گوێبەرخە؛ گوێبەرخۆڵە؛ گۆشت بەرخۆک؛ گۆشتەبەرغیلە؛ گیاگرێچک؛ گیاگرێ؛ ئالفەگیایەکی یەک‌ساڵەی خۆرسکە بە شیلەی تاڵ و گوڵی سوورەوە کە مێشەنگوین زۆری حەز لێیە ٢. *[گفتاری]* هەموو گیان؛ سەرتاپا؛ ئازای ئەنام؛ لە تەپڵی سەرەوە تا پەنجەی پا.

**هفت‌بیجار** / haftbîcār/ ☜ **هفته‌بیجار**

**هفت‌تیر** / haft(t)îr ، ـها/: *اسم*. حەفت‌تیر؛ حەوتیر؛ هەفتیر؛ دەمانچە؛ دەوانچە؛ چەکێکی گەرمی چکۆلەیە بۆ بەر پشتێن یان نێو باخەڵ.

**هفت‌تیربند** / haft(t)îrband ، ـها/: *اسم*. دەمانچەکێش؛ حەفت‌تیرکێش: ١. ئەوەی دەمانچە دەبەستێ ٢. کەسێ کە بە زۆری چەک کاری بەڕێوە دەبا ✻ **هفت‌تیرکش**

**هفت‌تیرکش** / haft(t)îrkeš/ ☜ **هفت‌تیربند**

**هفت‌جان** / haftcān/: *صفت*. سەگ‌گیان؛ گیان‌سەخت.

**هفت‌جوش**[1] / haftcûš/: *اسم*. هەمەندوش؛ حەوجۆش؛ حەفت‌جۆش؛ ئالیاژێکە لە ئاسن، سرپ، مس، قەلا، ڕۆح، زێڕ و زیو کە زۆر پتەو و خۆڕاگرە.

**هفت‌جوش**[2]: *صفت*. ١. *[گفتاری]* توند و تیژ؛ خورت؛ زێدەڕۆ ‹کمونیست هفت‌جوش: شیوعی توند و تیژ› ٢. زۆر کولاو ‹چای هفت‌جوش: چای زۆر کولاو› ٣. شارلاتان؛ زۆر فێڵباز.

**هفت‌خان** / haftxān/: *اسم*. *[کنایی]* حەوت‌خان؛ کاری زۆر دژوار و چەتوون.

**هفت‌خط** / haftxat ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت*. *[مجازی]* جامقولی‌باز؛ جانقولی‌باز؛ جیمقولی‌باز؛ شارلاتان؛ زۆر فێڵباز ‹این شوهرخواهر هفت‌خط تو هر روز یکی را تیغ می‌زند: ئەم شووخوشکە جامقولی‌بازەی تۆ، هەر ڕۆژێک و کەسێک تەڵەکە دەکا›.

**هفت‌سین** / haftsîn/: *اسم*. حەفت‌سین؛ حەوت ماکی وا، کە ناویان بە سینەوە دەست پێ‌دەکا (وەک سێو، سەوزە، سنجوو، سماق، سەمەنوو، سیر و سرکە) و لە سەر سفرەی ساڵی تازەوە بۆ مبارەکی دایدەنێن: **سفره‌ی هفت‌سین**

**هفتصد**[1] / haftsad/: *اسم*. حەوسەد؛ حەفسەد؛ حەفسە؛ هەوتسەی؛ حەوسەت؛ ژمارەی سەرەکی پاش شەشسەد و نەوەد و نۆ، پێش حەوسەد و یەک.

**هفتصد**[2]: *صفت*. حەوسەد: ١. یەکێک زۆرتر لە شەشسەد و نەوەد و نۆ ٢. حەوسەدەم.

**هفتصدم** / haftsadom/: *صفت*. حەوسەدەم؛ بە پلە و جێگای حەفسەدەوە.

**هفتصدمی** / haftsadomî/: *ضمیر*. حەوسەدەمی؛ حەوسەدەمین؛ ئەوەی لە ڕیز، پلە یان جێگای حەوسەدەمدایە.

**هفتصدمین** / haftsadomîn/: *صفت*. حەوسەدەمین؛ بە پلە و جێگای حەوسەدەمەوە.

**هفت‌صنار** / haf(t)sannār ، ـها/: *اسم*. *[گفتاری]* ٧٠٠ دینار، بەرانبەر بە چواردە شایی لە پارەی باوی ئێران لە ڕابردوودا.

**هفت‌کول** / haftkûl ، ـها/: *اسم*. حەفت‌کوول؛ دەوەنێک بە گەڵای ئەستووری کوڵکن، گوڵی سپی بۆنخۆش و میوەی ڕەشی گۆشتنەوە کە بۆ دەرمان دەشێ.

**هفتگی**[1] / haftegî/: *صفت*. حەفتەیی؛ حەوتوویی؛ هەفتانی؛ حەوتەیانە؛ هەفتۆک: ١. حەفتانە؛ حەوتانە؛ هەفتانە؛ پێوەندیدار یان سەر بە یەک حەوتە ‹دستمزد هفتگی: مزی حەفتانە› ٢. سەر بە حەفتە ‹کار هفتگی: کاری حەفتەیی›.

**هفتگی**[2]: *قید*. حەفتانە؛ هەفتانە؛ حەوتانە؛ حەوتوانە؛ بە حەفتە؛ حەفتە- حەفتە؛ لە درێژایی حەوتوودا ‹هفتگی مزد می‌گرفت: حەفتانە مزی دەساند›.

**هفتم** / haftom/: *صفت.* حەوتەم؛ حەفتەم؛ بە ڕیز، ڕزن، پلە یان جێگای حەوتەوە.

**هفتمی** / haftomî ، ـها/: *ضمیر.* حەوتەمی؛ حەفتەمی؛ ئەوەی لە ڕیز، پلە یان جێگای حەوتەمدایە.

**هفتمین** / haftomîn/: *صفت.* حەوتەمین؛ حەفتەمین؛ بە ڕیز، ڕزن، پلە یان جێگای حەوتەمەوە.

**هفته** / hafte ، ـها/: *اسم.* حەوتە؛ حەفتە؛ هەفتە؛ هەوی؛ حەوتوو؛ حەفتێ: ۱. یەکەی ئەندازە گرتنی کات بەرامبەر بە حەوت شەو و ڕۆژ ۲. چەرخەی کاتی، لە شەممەوە تا هەینی (حەفتەی ئێرانی)، یا لە دووشەممەوە تا یەکشەممە (حەفتەی فەرەنگی).

**هفته‌ای**[1] / hafte'î/: *صفت.* حەوتەیی؛ حەوتوویی؛ هەفتەیی.

**هفته‌ای**[2]: *قید.* حەفتانە؛ هەفتانە؛ حەوتوانە؛ بە حەفتە: ۱. بە پێ حەوتە ‹در آنجا هفته‌ای کار می‌کرد: لەوێدا حەفتانە کاری دەکرد› ۲. حەفتەیی؛ لە درێژایی هەر حەوتەیەکدا ‹هفته‌ای پانصد دلار خرج می‌کرد: حەفتانە پانسەد دولاری خەرج دەکرد›.

▣ هفته‌ای هفت روز: *[مجازی]* دایمەی خوا؛ دوانزەمانگەی خوا؛ دایم و دەرهەم؛ دایمە و دەرهەم؛ هەمیشە؛ هەمیشەدەرە؛ هەمووکاتێ ‹هفته‌ای هفت روزش را بیکار می‌گردد: دایمەی خوا بەتاڵ دەگەڕێ›.

**هفته‌بیجار** / haftebîcār/: *اسم.* حەفتەبیجار؛ حەفتڕەنگە؛ حەوتەبیجار؛ جۆرێ تورشی کە چەند (حەوت) جۆر سەوزی و خواردەمەنی تری تێ دەکەن: **هفت‌بیجار**

**هفده**[1] / hefdah, hevdah/: *اسم.* حەڤدە؛ حەڤقە؛ هەفدە؛ هاوتیس؛ هەڤدە؛ هەوتیس؛ ژمارەی سەرەکی پاش شازدە و پێش هەژدە.

**هفده**[2]: *صفت.* حەڤدە؛ حەڤقە: ۱. یەکێک زۆرتر لە شازدە ۲. حەڤدەهەم؛ ژمارەی حەڤدەهەم.

**هفدهم** / hefdahom, hevdahom/: *صفت.* حەڤدەهەم؛ حەڤقەهوم؛ هاوتیسن؛ بە ڕیز، ڕزن، پلە یان جێگای حەڤدەوە.

**هفدهمی** / hefdahomî, hevdahomî/: *ضمیر.* حەڤدەهەمین؛ هەڤدەهەمی؛ ئەوەی لە ڕیز، پلە یان جێگای هەڤدەهەمدایە.

**هفدهمین** / hefdahomîn,hevdahomîn/: *صفت.* حەڤدەمین؛ حەڤدەهەمین؛ حەڤقەهومین؛ بە ڕیز، ڕزن، پلە یا جێگای حەڤدەهەمەوە.

**هفهفو** / hafhafû ، ـها/: *صفت.[کنایی]* گەپۆ؛ پەپ؛ هەترەک؛ تایبەتمەندی پیری لەکارکەوتەی بێددان کە جوان قسەی پێناکردرێ: **هافهافو**

**هق ـ هق** / heqheq/: *صوت.* نسکەنسک؛ هەنسکەهەنسک؛ حەنسکەحەنسک؛ فینگەفینگ؛ دەنگی گریانی هێدی و بێبڕانەوە ‹هق ـ هق گریه‌اش را می‌شنیدم: دەنگی نسکەنسکی گریانیم دەبیست›.

▣ هق ـ هق کردن: *[گفتاری]* نسکەنسک کردن؛ نسکیان؛ نسکیەی؛ هەنیسک دان؛ نسکە دان.

**هکتار** / hektār/: [فرانسوی] *اسم.* هیکتار؛ هکتار؛ یەکەی پێوانی ڕووبەری زەوین بەرامبەر بە ۱۰۰۰۰ میتری چوارگۆش.

**هکتولیتر** / hektolîtr/: [فرانسوی] *اسم.* هیکتۆلیتر؛ یەکەی پێوانی بارستایی بەرامبەر بە ۱۰۰ لیتر.

**هکتومتر** / hektometr/: [فرانسوی] *اسم.* هیکتۆمیتر؛ یەکەی پێوانی درێژایی بەرامبەر بە ۱۰۰ میتر.

**هکذا** / hākazā/: [عربی] *حرف.* هەروەتر؛ هەروەها؛ هەروا؛ هەروەسا؛ هەرپاسە؛ هەر بەم جۆرە ‹من عصبانی بودم، هکذا آرام، که بیش از من عصبانی بود: من تووڕە بووم، ئارام هەروەتر، لە منیش تووڕەتر بوو›.

**هگــزان** / hegzān/: [فرانسوی]/اسم. [شیمی] هیگزان؛ هیدرۆکەربونی پارافینی تراو کە لە نەوت بەرهەم دێت.

**هل** / hel ، ـها/: اسم. حل؛ هل؛ هێل؛ حێل: ١. ئاڵفەگیایەکی گەرمەسیری گەڵادرێژ و گوڵ هێشوویبە ٢. بەری ئەو گیایە کە زەردە و دەنکی بۆنخۆشی تێدایە ٣. دەنکی ئەو گیایە کە بەهاراتە.

▣ **هل پوک/ پوچ**: [گفتاری] ١. حلی بێ دەنک ٢. پووچەڵ؛ شتی بێبایەخ.

**هل** / hol/: اسم. [گفتاری] پاڵ؛ بۆق؛ باو؛ چۆق؛ نوسک؛ دەڵەک؛ هەوڵ؛ کاری پاڵ پێوە نان ‹مرا هل داد و انداخت بیرون: پاڵی پێوە نام و خستمیە دەرەوە›.

▣ **هل دادن**: پاڵ پێوە نان؛ داپێچاندن؛ ڕەپێچەکدان؛ ڕافاندن؛ داپێچانن؛ داپێچین؛ داپێچان؛ ڤەزۆقاندن؛ بۆق نیان؛ بۆق دان؛ بۆق نیای/ نیەی؛ چۆق نیان؛ باو نان؛ دەڵەک دان؛ دەس نیان؛ نوسک دایش.

**هلاک** / halāk/: [عربی] صفت. مردوو؛ مردگ؛ مردی؛ تیاچووگ.

▣ **هلاک بودن**: [مجازی] بۆ مردن؛ گیان دەرچوون؛ گیان دەرهاتن؛ دڵ دەرهاتن؛ زۆر خوازیار و بەتاسە بوون ‹هلاک دختره بود: بۆ کچەکە مردبوو›.

**هلاک شدن**: ١. مردن؛ مەردەی ‹از تشنگی هلاک شد: لە تینوویەتیدا مرد› ٢. بەرڤین؛ سڵسارد بوونەوە؛ مردن لە ڕێی خراپدا.

**هلاک کردن**: تێدا/ تیا بردن؛ کوشتن؛ کوشتەی؛ بەینەنە بەردەی ‹سرما چند نفر را هلاک کرد: سەرما چەن کەسی تیدابرد›.

**هلاکــت** / halākat/: [عربی]/اسم. دۆخ یان چونیەتی مردن؛ تێدا/ تیا چوون؛ نەمان؛ نەمەنەی.

▣ **بە هلاکت رساندن**: کوشتن؛ کوژتن؛ کوشتەی؛ تێدا/ تیا بردن؛ لە بەین بردن؛ بەینەنە بەردەی ‹انفجار مین دو نفر را به هلاکت رساند: تەقینەوەی مین دووکەسی کوشت›.

**به هلاکت رسیدن**: کوژران؛ کوژیان؛ تێدا/ تیا چوون؛ لەبەین چوون؛ بەینەنە شیەی؛ کوشیەی ‹در آن درگیری یک نفر به هلاکت رسید: لەو شەڕەدا کەسێک کوژرا›.

**هلال** / helāl ، ـها؛ أهلّه/: [عربی]/اسم. هێڤک؛ مانگیلە؛ هەیڤک؛ هیلال: ١. مانگی نۆ؛ نووهیڤ؛ مانگی تازە ٢. کەوان؛ کەوانە ٣. هەر سیمایەکی وەک مانگی نوێ.

**هلال احمر** / helal(e)'ahmar/: [عربی]/اسم. هەیڤی‌سوور: ١. وێنەی هێڤێکی سوور لە تەختێکی سپیدا کە دروشمی کۆمەڵەی هێڤی سوورە ٢. دامەزراوەیەک لە وڵاتانی ئیسلامیدا کە فریای لێقەوماوان دەکەون.

**هلالی** / helālî/: [عربی] صفت. مانگیلەیی؛ کەوانی؛ وەکوو بیچمی کەوان.

**هلاهل** / halāhel/: [سنسکریت]/اسم. گیاژار؛ هەلاهیل؛ هەلاهەل: ١. بنە گیایەکی یەکساڵانی ژەحری لە تیرەی هەڵاڵەیە بە گوڵی ورد و لقی هلۆلەوە، لە پەنا چۆم و شوێنی شێدار دەڕوێ ٢. شیلەی ئەو گیایە کە ژارێکی زۆر کوشندەیە.

**هلفدانی** / holofdānî ، ـها/: اسم. [عامیانە] هولفدو؛ زیندان؛ بەندیخانە؛ گرتووخانە: **هلفدونی**

**هلفدونی** / holofdûnî/ ☜ **هلفدانی**

**هلف ـ هلف** / halafhalaf/: صوت. هەڵپەهەڵپ؛ دەنگی خواردنی بە ئاز و لەز.

**هلک(و)هلک** / helek(k-o)helek/: قید. [گفتاری] فسەفس؛ شلەشل؛ بە هێواشی؛ زۆر لەسەرخۆ.

**هلک و هلک** / holokk-o-holok/: قید. [گفتاری] پەلەپەل؛ تون‌ـتون؛ هەوڵەهەوڵ؛ بەلەز و پەلە.

**هلمیم** / holmiyom/: اسم. هولمیوم؛ توخمی

کیمیاوی کانزایی لە دەستەی لانتانیدەکان، بە ژمارەی ئەتۆمی ٦٧ و کێشی ئەتۆمی ١٦٤,٩٣ کە پێکهاتەکانی میغناتیسیە.

**هلنیسم** / helenîsm/: [فرانسوی]/اسم. یوونانیگەری؛ شوێنگری فەرهەنگی یوونانی کەونارا.

**هلو** / holû, hulû ، ـها/: اسم. هولوو؛ هەشتالوو؛ هڵوو؛ قۆخ؛ کۆخ؛ خۆخ؛ قۆخی: ١. دارێک بە گەڵای باریک و درێژەوە کە لێوارەکەی دانووشتاوە و گوڵی گەورەی پەمەیی مەیلەو ئەرخەوانی دەر دەکا ٢. میوەی گۆشتن، درشت، شیرین و ئاوداری ئەو دارە کە پێستیکی ناسک و کوڵکنی زەرد و سوور بە پێشەی درشتی چێویەوە هەیە ٣. *[کنایی، گفتاری]* کچ یان ژنی زۆر جوانی بەتایبەت سوور و سپی.

**هلوانجیری** / holûanciri, hulûanciri/: اسم. *[گیاەشناسی]* هەشتاڵووهەنجیری؛ هولووهەنجیری؛ قۆخەهەنجیری.

**هلوسن** / holosen/: [فرانسوی] ☜ **هولوسِن**

**هل و گل** / hel-o-gol/: اسم. *[مجازی]* گوڵ و شیرینی؛ نوقڵ و شیرینی؛ دیاری سەردان ‹هل و گلی بخریم و برویم دیدنش: گوڵ وشیرینیەک بسێنین و بڕۆین سەرێکی لێ بدەین›.

**هل هلکی** / holholaki/: قید. *[گفتاری]* بەپەلە؛ پەلەپەل ‹هل‌هلکی یه چیزی خورد و رفت: بەپەلە شتێکی هەڵخست لێی‌دا ڕۆی›.

**هلهله** / helhele, halhale ، ـها/: اسم. هەلەلا؛ حەلەلا؛ هەڵەڵە؛ هەلەلە؛ هەڵهەلالە؛ کڵ؛ تریلیلی؛ تلی‌لیلی؛ تلی ـ تلی؛ تلیلیتی؛ پلەزیقان؛ هەرا و زەنەی شادی و خۆشی خەڵک ‹با آمدنش هلهلەی مردم به آسمان رفت: بە هاتنی هەلەلای خەڵک بەرزەوە بوو›.

**هله ـ هوله** / halehûle ، ـها/: اسم. *[گفتاری]* هەڵیتەوپڵیتە؛ خواردەمەنی جۆراوجۆی و ناسازگار ‹لابد باز هله‌ـهوله خوردی، این طور شدی: دیارە دیسانەوە هەڵیتەوپلیتەت خواردوە وا وات لێهات›.

**هلیکوپتر** / helîkopter ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. هیلی‌کوپتەر؛ کۆپتەر؛ باڵەفڕینەک؛ کەرستەی گواستنەوەی هەوایی کە بە هەڵخولانی یەک یان دوو فڕفڕە هەڵدەفڕێ و دەتوانێ لە شوێنی خۆیەوە ڕاست بەرز بێتەوە.

**هلیله** / halîle ، ـها/: [سنسکریت]/اسم. هەلیلە؛ بەری دارێکە لە تیرەی بادام، لە هێندوستان دەڕوێ و ڕەش و زەردی هەیە و بۆ دەرمان دەبێ.

**هلیم** / halîm/: [از عربی]/اسم. حەلیم؛ چێشتێک لە گەنم و گۆشتی کوتراو کە بە دارچین و شەکر و ڕۆنەوە دەخورێ: **حلیم**[1]؛ **هریسه**

**هلیم** / helyom/: [فرانسوی]/اسم. هیلیوم؛ توخمێکی کیمیاوی لە دەستەی گازە نەجیبەکان بە ژمارەی ئەتۆمی ٢ و کێشی ئەتۆمی ٤ کە سۆک و بێ‌ڕەنگە و لە هەواشدا هەیە، بۆ پڕکردنی باڵۆن و دڵۆپی گازی بە کار دەچێ.

**هم**[1] / ham/: حرف. ـ یش؛ ـەش؛ ـیچ؛ ـ ژی: ١. هەروەها ‹من می‌دانستم او هم می‌دانست: من دەمزانی ئەویش دەیزانی› ٢. تەنانەت ‹از من هم بهتر می‌دانست: لە منیش باشتری دەزانی› ٣. زیادە لەوە ‹خیلی هم خوب می‌دانست: زۆریش باشی دەزانی› ٤. بەم حاڵەوە ‹غریب بود و پول هم نداشت: غەریب بوو و پارەشی نەبوو› ٥. هەم؛ هەرتک ‹هم این و هم آن: ئەمەش و ئەوەش›.

**هم**[2]: ضمیر. یەک؛ یۆ؛ یەکتری ‹دنیای امروز پر از حریفان زورمند است که با هم دست به گریبانند: دونیای ئەورۆ پڕە لە قەبۆی زۆردار کە دەستەویەخەی یەکن›.

**هم ـ**: *پیشوازه.* هاو ـ؛ هەڤ ـ؛ هەم ـ؛ هام ـ؛ ئام ـ؛ هاڤ ـ؛ ئاو ـ؛ هەو: ١. بە هەمان بار و دۆخ، چۆنیەتی، تایبەتمەندی یان کردەوەوە ‹همدما؛

هم‌عرض: هاوده‌ما؛ هاوبه‌ر› ٢. به هه‌مان كار و چالاكی و لێهاتوویییه‌وه ‹هم‌صحبت؛ همكار: هاوقسه؛ هاوكار›.

▣ **هم آمدن**: هاتنه یه‌ک؛ هاتنه‌وه یه‌ک: ١. ده‌م هاوردنه یه‌ک ‹سر زخم هم آمد: ده‌می برینه‌كه هاته‌وه یه‌ک› ٢. كۆتایی پێ‌هاتن؛ دوایی هاتن ‹سر و ته قضیه هم آمد: سه‌ر و بنی كێشه‌كه هاته یه‌ک›. هه‌روه‌ها: **هم آوردن**

هم زدن: شڵه‌قاندن؛ شێواندن؛ هه‌ڵشێواندن؛ تێكه‌ڵدان؛ تێكه‌ڵ كردن؛ ئاوێته‌كردن؛ هۆرشڵێونه‌ی؛ شڵه‌قنای؛ داچنه‌ی ‹زرده‌ی تخم‌مرغ را خوب هم بزن: زه‌ردێنه‌ی هێلكه‌كه باش بشڵه‌قێنه›: **به هم زدن ـ١**

هم كشیدن ☜ **درهم كشیدن**

هم گذاشتن: لێكنان؛ نیانه یه‌ک؛ نانه‌وه؛ نانه سه‌ر یه‌ک؛ خستنه سه‌ر یه‌ک؛ نیه‌ی پێوه‌ره ‹چشمم را هم گذاشتم: چاوم لێكنا›.

از هم پاشیدن: ١. لێک‌هه‌ڵوه‌شان؛ هه‌ڵوه‌شیان؛ تێكچوون؛ له ناو چوون ‹آن شركت از هم پاشید: ئه‌و به‌شدارگه‌یه لێک‌هه‌ڵوه‌شا› ٢. پرژ و بڵاو بوونه‌وه؛ لێک بڵاو بوونه‌وه؛ لێک به‌ر بوون ‹جمعیت از هم پاشید: ئاپۆره‌ی خه‌ڵک پرژ و بڵاو بوونه‌وه›.

بر هم زدن: تێكدان؛ هه‌ڵشێواندن؛ شێواندن: ١. هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه ‹قرارها را بر هم زدند: بڕیاره‌كانیان هه‌ڵوه‌شانده‌وه› ٢. دانه یه‌كدا؛ ئاژاوه و شڵه‌ژاوی پێكهێنان ‹با جار و جنجال گردهمایی را بر هم زدند: به هه‌را و هوریا كۆبوونه‌وه‌كه‌یان تێكدا› * **به هم زدن**

به هم خوردن: ١. تێكچوون؛ تێک‌شیه‌ی؛ شێویان؛ هه‌ڵشێویان ‹حالم به هم خورد: حاڵم تێكچوو› ٢. شێویان؛ هه‌ڵوه‌شانه‌وه؛ هه‌ڵوه‌شیان؛ تێكچوون؛ شێویه‌ی؛ هۆرشێویه‌ی ‹عروسی به هم خورد: گۆڤه‌نده‌كه شێوا› ٣. لێكدان؛ وێكه‌وتن؛ وێكه‌فتن؛ پێكدادان؛ پێكدان؛ دان له یه‌ک ‹دو تا ماشین به هم خوردند: دوو ماشین لێكیان دا› ٤. پێک‌هاتن؛ لێک‌كاڵانه‌وه ‹كراوات و پیراهنت به هم می‌خورند: كه‌راوات و كراسه‌كه‌ت پێک دێن›.

به هم ریختن: ١. تێكدان؛ شێواندن؛ شێونه‌ی؛ هه‌ڵوه‌شاندنه‌وه؛ هه‌ڵپێچاندن ‹عروسی را به هم ریخت: زه‌ماوه‌نده‌كه‌ی تێكدا› ٢. شپرز بوون؛ شێوان؛ تێكه‌ڵ ـ پێكه‌ڵ بوون؛ شێویای ‹اوضاع شركت به هم ریخته بود: بار و دۆخی به‌شدارگه شپرز بوو›.

به هم زدن: ١. ☜ **هم زدن** ٢. ☜ **بر هم زدن** ٣. داخستن؛ به‌ستن؛ مسمتاندن ‹شركت را بر هم می‌زنیم: به‌شدارگه‌كه داده‌خه‌ین›.

در هم كشیدن: هێنانه یه‌ک؛ دانه یه‌ک؛ تورشاندن؛ دا پێوه‌ره‌ی؛ مۆن‌كردن ‹ابروهایش را در هم كشید: برۆی هێنایه یه‌ک›: **هم كشیدن** *[گفتاری]*

**هم** / ham(m)/: [عربی] /اسم. ١. *[ادبی]* هه‌وڵ و ته‌قالا؛ كۆشش؛ كۆششت؛ ته‌پشت ‹تمام هم خود را صرف این كار كرد: هه‌موو هه‌وڵ و ته‌قالای خۆی خسته ناو ئه‌م كاره› ٢. كوڵ؛ خه‌م؛ په‌ژاره؛ ئه‌ندۆ ‹هم و غم: كوڵ و كه‌سه‌ر›.

**هم‌آغوشی** / hamāqûšî/: /اسم. تێكه‌ڵی؛ هاوجێیی؛ یه‌كتر له باوه‌ش‌گرتن بۆ تێكه‌ڵاوی جینسی.

**هما** / homā/: /اسم. ١. هوما؛ سووره‌واڵه؛ باڵدارێكی چیرۆكانه، به‌خته‌وه‌ری دێنێ: **همای** ٢. /لـها/ شاهێن؛ شه‌هێن؛ مكۆر؛ په‌له‌وه‌رێكی ڕاوكه‌ره ڕیشێكی ڕه‌شی هه‌یه.

**هم اتاق**[1] / hamotāq, -'otāq/: [فارسی/ ترکی] ☜ **هم‌اتاقی**[1]

**هم اتاق**[2]: صفت. هاودیو؛ هاوئۆده؛ هاوئوتاق ‹من و آزاد در دوره‌ی دانشجویی هم‌اتاق بودیم: من و ئازاد له سه‌رده‌می خوێندكاریدا هاودیو بووین›:

**م‌اتاقی ۲**

**م اتاقی ۱** / hamotāqî, -'otāqî ، ـها/: [فارسی/ رکی]/*سم.* هاودیو؛ هاوئۆدە؛ هاوئوتـاقی ‹آن شـب م‌اتاقی من نیامده بود: ئەو شـەوە هاودیوەکـەی مـن ەهاتبوو›: **هم‌اتاق**

**م اتاقی ۲** ☞ [فارسی/ ترکی] **هم‌اتاق ۲**

**ماتوری** / hemātûrî/: [فرانسوی]/*سم. [پزشکی]* یماتووری؛ دیاردە یان دۆخی هەبوونی خـوێن میزدا: **خون‌اداری؛ خون‌شاشی**

**ماتوزوئر** / hemātozo'er ، ـها/: [فرانسوی]/*سم. یست‌شناسی]* خوێنژی؛ خـوێنمژە؛ هیمـاتۆزۆئێر؛ یانداری کژنگی خوێن.

**مـاتولوژی** / hemātolojî/: [فرانسـوی]/*سـم. رشکی]* خـوێن‌ناسـی؛ هیمـاتولۆژی؛ زانسـتی سینەوە و بەرگری لە نەخۆشی خوێن.

**ماتوم** / hemātom/: [فرانسوی]/*سم. [پزشکی]* یماتوم؛ لک یان ماسێ کـە خـوێنی تێـدا کـۆ تەوە.

**ماتیت** / hemātît/: [فرانسوی]/*سم. [کانی‌شناسی]* یماتیت؛ خـاکی ئاسـن؛ خـاکێکی سـوورە کـە سنی زۆرە و ئاسن و پۆلای لێ بەرهەم دێنن.

**م‌ارز** / ham'arz ، ـها/: *صفت.* هاونرخ؛ هاوپـارە؛ وبایی؛ هەقبەر؛ بە بایەخی یەکسانەوە.

**مـاره** / hamāre/: *قیـد. [ادبـی]* هەمیشـە؛ ـەمووکاتێ؛ هـەمووکاتێک؛ هـەموودەمـێ؛ ـەرکات؛ هـەردەم؛ هـەرجار؛ هـەموودەم؛ ەمووکات.

**م اکنون** / hamaknûn/: *قید. [ادبی]* ئێسـتاکە؛ ویستا؛ ئائێستا؛ هەر ئێستا؛ هـەر ئیسـە؛ نهـۆ؛ وکـە؛ هـەنگا؛ هەنووکـە؛ ئێسـتەکانێ؛ ستەکوونێ؛ ئێسـتاکوونێ؛ دەپەسـا ‹هم‌کنون شم‌انتظار یاری شما هستیم: ئێستاکە چاوەڕوانی رمەتیتانین›.

**مان ۱** / hamān/: *صفت.* هـەر ئـەو؛ هـەر ئـان؛ وە؛ هەمان؛ هەرئا ‹همان خانه را می‌خرم: هەر ئەو خانووە دەکڕم›.

**همان ۲**: *قید.* هەر ئەو؛ هەمان؛ هـەرئا؛ تـەنیا؛ بـە تەنیا؛ بە تەنێ؛ تەنها ‹همان یک شب که آنجا بـودم همه چیز دەستگیرم شد: هەر ئەو شەوە کە لەوێ بـووم هەموو شتێکم زانی›.

**همان ۳** / ـها/: *ضمیر.* هەر ئەوە؛ هـەر ئـا؛ هـەمان؛ کەس یان شتێکی ئاماژە پێکراو یان وتراو ‹همان را بردار که گفتم: هەر ئەوە هەڵگرە وا گوتم›.

▣ **همان آش و همان کاسه** ☞ آش همان آش و کاسه همان کاسه، **آش**

**همانا** / hamānā/: *قید. [ادبی]* بەڕاسی؛ بەڕاسـتی؛ بێ‌گومان؛ بێ‌شەک؛ لەڕاستیدا.

**هم‌اندیشی** / hamandîšî/: /*سم.* هـاودەنگی: ١. هاوبیری؛ هاوڕایی؛ کار و ڕەوتی پێکـەوە بـیر کردنەوە بۆ هاوکاری٢. /ـها/ کۆڕ؛ کۆبوونەوە.

**همانگویی** / hamāngûyî ، ـها/: /*سم.* خۆی وەک خۆیی؛ کار و ڕەوتی دەربڕینی مانا یان وشەیەک هەر بە خۆی (وەک ئەوەی بێـژین «پیـاوی چـاک ئەو پیاوەیە کە پیاوێکی چاک بێ»).

**همانند ۱** / hamānand ، ـها/: /*سم.* لف؛ هاوتـا؛ هاوچەشـن؛ هاوشـێوە؛ وەکـوو؛ وەک؛ وەکـێ؛ وەکوک؛ هەروەکوو؛ هەروەکی؛ وێنـەی؛ چـون؛ پسەو؛ کوت‌ومت؛ وەسـە؛ لـەگوێن؛ لـە ڕەنگـی؛ شتی؛ مینا؛ کەسێ یان شتێک بە تایبەتمەنـدی کەس یان شتێکی ترەوە ‹همانند کسی است که تازه زبان باز کرده است: وەکوو کەسێکە تازە زمـانی گرتبێ›.

**همانند ۲**: *صـفت.* وەک‌یـەک؛ وەکوویـەک؛ لەیەک‌چوو؛ لێـک‌چـوو؛ لـە ڕەنگـی یـەک؛ لـە چەشنێک؛ یەک‌توخم؛ چـون یـەک؛ هاوشـێوە؛ هاوچەشن؛ میناک ‹قیافەشان همانند بود: سـیمایان وەک‌یەک بوو›.

**همانند** / hamānande/: *حـرف.* وەکـوو؛ وەک؛ وەکی؛ مینا؛ پێسەو؛ چـون؛ وێنـەی؛ لـە گـوێن ‹همانند شیر: وەکوو شێر›.

**هماندسازی / hamānandsāzî**، ـها/: *اسم.* ۱. *[فیزیولۆژی]* ڕەوتێ لە لەشی گیانەوەراندا کە ماکی خۆراکی دەبێتە ماکی ئالی ۲. *[روان‌شناسی]* ڕەوتێکی وا کە مرۆ بێ ئەوەی بە خۆ بزانێ بیر، هەست و کاری کەسێک لاسایی دەکاتەوە.

**هماندی / hamānandî**، ـها/: *اسم.* لێکچوویی؛ وێکچوویی؛ هاوشێوەیی؛ هاوچەشنی؛ میناکی؛ دۆخ یان چۆنیەتی وەکوو یەک بوون.

**هماورد[1] / hamāvard**، ـان/: *اسم. [ادبی]* قەب؛ قەبۆ؛ حەریف؛ غەنیم؛ خەنیم؛ لایەنی بەرامبەر لە ڕکەبەرێ یان ململانەدا.

**هماورد[2]**: *صفت. [ادبی]* هەڤبەر؛ هەڤبەز؛ لێهاتوو بۆ شەڕ یان ململانێ دەگەڵ کەسانێتردا.

**هماوردی / hamāvardî**/: *اسم. [ادبی]* دۆخ یان چۆنیەتی حەریف بوون.

**هماوری / hamāvarî**/ ☜ **تولیدمثل**

**هماهنگ / hamāhang**، ـها/: *صفت.* هەماهەنگ؛ هاوئەزم: ۱. بە بەشگەلێکی هاوساز دەگەڵ یەکتردا ‹تجهیزات هماهنگ: کەرستەگەلی هەماهەنگ› ۲. هاوئاهەنگ؛ هاودەنگ؛ یەک‌نەزم ‹نوازندگان هماهنگ: ژەنیارانی هاوئاهەنگ› ۳. هاوقۆڵ؛ بە دۆز، ئامانج، مەبەست یان کارێکی هاوبەش و هاوڕێ دەگەڵ یەکتردا ‹اقدام هماهنگ: کاری هاوقۆڵ›. هەروەها: **هماهنگ بودن؛ هماهنگ شدن؛ هماهنگ کردن**

**هماهنگی / hamāhangî**، ـها/: *اسم.* هەماهەنگی؛ هاودەنگی؛ هاوئاهەنگی: ۱. *[موسیقی]* پێکهاتەی مۆسیقا لە بواری تێک‌ئالاوی و دوا بە دوایی ئاکۆردەوە ۲. *[موسیقی]* زانستی پێکهاتە، پێوەندی و دوا بە دوایی ئاکۆردگەل ۳. دۆخی ڕێکخستن و وێکخستنی جوان و ڕێک‌وپێکی پاژگەل ٤. ئاریکاری؛ هاوڕێیی؛ هاوکاری.

**همای / homāy**/ ☜ **هُما۔۱**

**همایش / hamāyeš**، ـها/: *اسم.* کۆڕ؛ کۆنگرە؛ جڤات؛ کار و ڕەوتی کۆبوونەوە؛ دانیشتن و گەل بەستن.

**همایون[1] / homāyûn**/: *اسم. [موسیقی]* هومایۆن؛ لە دەزگاکانی مووسیقای ئێرانی.

**همایون[2]**: *صفت.* پیرۆز؛ هەزەخ؛ موبارەک؛ مووارەک؛ ممبارەک.

**همایونی / homāyûnî**/: *صفت.* ۱. پیرۆز؛ موبارەک؛ ممبارەک ۲. شکۆدار؛ بەشکۆ ۳. هومایوونی؛ نازناوێک بۆ شا و شازادەگەل.

**همنوپاتی / home'opātî**/: [؟]*اسم. [پزشکی]* هومیئۆپاتی؛ شێوە دەرمانێک بریتی لە نواندنی دەوایەکی وا کە لە ساخدا وردە نیشانەگەلی وەک نەخۆشی ڕەچاوکراو بەدی بێنێ بەڵام لەشی پێ نەخۆش نەکەوێ و هەر وا وردە۔ وردە هەندی دەرمانەکە زۆرتر بێتەوە تا ئەو ڕادە کە چیتر ئەو نەخۆشینە بە لای ئەو کەسەدا نەچێ: **هومئوپاتی**

**همباد / hambād**/: *صفت.* هاوبالا؛ هاوبەرزی؛ هاوبان؛ خاوەن بەرزاییەکی بەرامبەر ‹این ساختمان با آن یکی همباد است: ئەم ماڵە هاوبالای ئەوی دیکەیە›.

**همبازی / hambāzî**، ـها/: *اسم.* هاوکایە؛ هەڤلیز؛ هاوگەمە؛ هاوبازی؛ هامگەمە؛ هەمبازی: ۱. ئەوانەی پێکەوە کایە دەکەن ۲. ئەندامانی تیمێکی وەرزشی ۳. هاوشانۆ؛ ئەوانەی پێکەوە لە فیلم یان شانۆیەکدا کایە دەکەن.

**همبر / hambar**/: *صفت. [ادبی]* شان بە شان؛ پاڵ بە پاڵ؛ هاوبەر؛ هاوپاڵ؛ هاوڕیز؛ هاوشان.

**همبرگر / hamberger**، ـها/: [انگلیسی]*اسم.* هەمبیرگر؛ هەمبەرگر؛ خۆراکێ لە گۆشتی وردکراو، پیوازی جنراو، خوێ و بەهارات کە گەلاگەلای دەکەن و لە ڕۆندا سووری دەکەنەوە.

**همبستر / hambastar**، ـها/: *صفت. [کنایی]* هاوجێ؛ هاوخەو؛ هاونوێن، زۆرتر بۆ هاوجێیی.

⊡ همبستر شدن با کسی: هاوجێ بوون دەگەڵ

کەسێکدا؛ سەرجێیی کردن لەگەڵ کەسێکدا.

**همبستری** / hambastarî/: *اسم. [کنایی]* هاوجێیی؛ هاوخەوی؛ هاونوێنی؛ سەرجێیی؛ کار و ڕەوتی پێکەوە لە نوێنێکدا خەوتن و لۆکاندن.

**همبستگی** / hambastegî ، ـها/: *اسم.* هاوگری؛ یەکگری؛ یەکانگیری: ١. دۆخ یان چۆنیەتی یەکگرتوو بوون ٢. هاوپێوەندی؛ پێوەندی نێوان دوو لایەن ٣. *[سیاست]* هاوکاری؛ هاوبیری؛ هاودەنگی؛ پشتیوانی لە ئامانج یان تاقمێکی تایبەت.

**همبسته**[1] / hambaste ، ـها/: *اسم.* ئالیاژ.

**همبسته**[2]: *صفت.* یەکگر؛ یەکانگیر؛ هاوپێوەند؛ بە پێوەندێکی دوولایەنەوە.

**همبند** / hamband ، ـها/: *صفت.* هەڤبەند؛ هاوبەند؛ هامبەند: ١. هۆی پێکەوە لکاندن ‹بافت همبند: شانەی هاوبەند› ٢. /ـان/ هاوبەند؛ هاوزیندانی؛ لە یەک بەندی گرتووخانەیەکدا ‹من با آزاد همبند بودم: من و ئازاد پێکەوە هاوبەند بووین›.

**همبود** / hambûd ، ـها/: *اسم. [جامعه‌شناسی]* کومون؛ کۆمەڵێک کە یەکەیەکەیان پێکەوە شەریکن و ئەوەی هەیە بە هەمووەوە یەک دەگا.

**همپا** / hampā/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* هاوپا؛ هاوشان؛ ئامپا؛ هاوڕێ.

**همپالکی** / hampālakî ، ـها/: *اسم. [کنایی]* هاودەس؛ هاوکاسە؛ هەر کام لەو کەسانەی پێکەوە (بەتایبەت لە کارێکی درێودا) هاوکارن.

**همپایه** / hampāye ، ـها/: *صفت.* ١. هاوتا؛ هاوسەنگ؛ هاوشان؛ هامشان؛ هامبەر؛ هامپلە؛ هاوپلە؛ هاوڕیز؛ هاوپلەوپایە ٢. هاوتەراز؛ بەرانبەر بە یەک.

**همپشتی** / hampoštî ، ـها/: *اسم. [گفتاری]* پشتگری؛ پاڵپشتی؛ پشتیوانی ‹خوب است، تو هم که همپشتی او را می‌کنی!: زۆر باشە، ئەتۆش خۆ پشتگری لەو دەکەی!›.

**همپوشانی** / hampûšānî/: *اسم.* یەکپۆشی؛ کار و ڕەوتی یەکتر داپۆشان یان چوونە ناو یەکی دوو شت.

**همپیاله** / hampiyāle ، ـها/: [فارسی/ یونانی]/*اسم.* هاوپیالە؛ هەمپیالە؛ هامپیالە؛ ئامپیالە؛ هەڤپیالە؛ هەڤبەزم؛ هاواڵ و بەشدار لە خواردنەوەدا ‹سال‌ها در کافه‌ی آرام همپیاله بودند: زۆر سالان لە کافەی ئارامدا هاوپیالە بوون›.

**هم‌پیمان** / hampeymān ، ـها؛ ـان/: *اسم.* هاوپەیمان؛ هەمپەیمان؛ هاوبڕیار؛ هاوسوێند؛ هاوسۆند ‹گروه‌هایی که تا پیش از انقلاب هم‌پیمان بودند، بعد از انقلاب به جان هم افتادند!: ئەو گرۆیانەی تا پێش لە شۆڕش هاوپەیمانی یەکتر بوون، دوای سەرکەوتنی شۆڕش کەوتنە گیانی یەکتر!›.

**همت** / hemmat/: [عربی]/*اسم.* هیمەت؛ هەڵگ: ١. دۆخی لێبڕان بۆ پێشکەوتن و گەیشتن بە ئامانجگەلی بەرز ‹برای پیشرفت و ترقی باید همت داشت، نە شانس: بۆ پێشکەوتن و هەڵدان دەبێ هیمەت هەبێ نەوەک شانس› ٢. دۆخی لە خۆ نەوین ‹همت کردن: هیمەت کردن›. هەروەها: **همت داشتن؛ همت کردن**

**همتا**[1] / hamtā ، ـها؛ ـیان/: *اسم.* هاوتا؛ ئاڤتا؛ ئامتا؛ هامتا؛ هەوتا؛ تاوەک؛ هیتە؛ هاوشان؛ هەڤتا؛ هەمبەر؛ هەمپا؛ هنداق؛ لنگە؛ هاوتەک: ١. وێنە؛ جووت؛ جفت؛ تا؛ لف؛ هاوماڵ؛ دەستە؛ هاولف؛ هاملف؛ ئەو شتانەی لە شکڵ، تایبەتمەندی، کار یان کەلکدا وەکوو یەک بن ‹این یکی همتا ندارد: ئەم دانە وێنەی نیە› ٢. ئەو کەسانەی لە کار یان پلەدا وەکوو یەکن ‹وزیر امور خارجه با همتای ژاپنی خود دیدار کرد: وەزیری کار و باری دەرەوە چاوی بە هاوتای ژاپونی خۆی کەوت›.

**همتا**[2]: *صفت.* لف؛ لنگە؛ جووت؛ جفت؛ هاولف؛ هاملف؛ هاوتا؛ هامتا؛ هەوتا؛ هاوتەک؛ میناک؛ بە شکڵ، تایبەتمەندی، کار یان کەلکی وەکوو

یەکەوە ‹این پیاله همتای آن یکی است: ئەم پیالە لفی ئەویترە›.

**همتراز** / hamtarāz ، ـها/: صفت. هاوتەراز؛ بەرانبەر؛ هامتەراز؛ هامتراز: **همطراز**

**همتوان** / hamtavān ، ـها/: اسم. ١. هاوهێز؛ هاووزە؛ هاوزۆر؛ دوو یان چەند کەس یا شت کە هێزیان بە قەد یەکە ٢. [فیزیک] هاوتەوژم؛ هاوفشار.

**همجنس** / hamcens ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. هاوجنس؛ هاوجسن؛ هاودەسە؛ هامجنس؛ هاوڕەگەز.

**همجنس‌بازی** / hamcensbāzî/: [فارسی/ عربی/ فارسی] اسم. الف): پانپانۆکێ؛ پاپانۆکە؛ قاش (بۆ ژن) ب): نێرەبازی؛ نێربازی (بۆ پیاو)؛ کاری لۆکاندنی دوو هاوجنس (پیاو و پیاو یان ژن و ژن) پێکەوە. هەروەها: **همجنس‌باز**

**همجنس‌خواهی** / hamcensxāhî/: [فارسی/ عربی/ فارسی] اسم. [روان‌شناسی] حەز بە هاوجنس و واز بۆ لۆکاندنی هاوجنسی خۆ. هەروەها: **همجنس‌خواه**

**همجوار** / hamcavār/: [فارسی/ عربی] صفت. دراوسێ؛ هاوسێ؛ هاوسا؛ هامسا؛ هاوسنوور ‹کشورهای همجوار: وڵاتانی دراوسێ›.

**همجواری** / hamcavārî/: [فارسی/ عربی] اسم. دراوسێیەتی؛ هاوسێیەتی؛ هاوسایی؛ دراوسێتی؛ دراوسێیی؛ هامساگەری؛ هامسایی؛ هاوسنووری ‹ همجواری با این جور آدمها مشکل است: دراوسێیەتی لەگەڵ ئەم تاقمە کەسانە دژوارە›.

**همجوشی** / hamcûšî/: اسم. ١. کار و ڕەوتی توانەوە یان نەرم بوونەوە بە گەرما ٢. [شیمی] فیوژن؛ ڕەوتی پێکەوە لکانی ناوکەی دوو ئەتومی چکۆلە و دروست بوونی ئەتومێکی گەورەتر، کە هاورێ لەگەڵ بەرهەمهاتنی هێزێکی یەکجار زۆرە ٣. [مجازی] سازگاری؛ تەبایی.

**همچشمی** / hamčešmî/: اسم. [مجازی، گفتاری] چاولێگەری؛ هاڤرکێ؛ هەڤرکێ؛ ڕکبەرکێ؛ ڕقەبەری؛ ڕکبەرکێنە؛ قینەبەری؛ ڕکەبەری؛ هاڤرکی؛ کێبەرکێ؛ بەربەرەکانێ.

**همچنان** / hamčenān/: قید. هەروا؛ هەروەسا؛ هەروسا؛ هەرئاوا؛ هەروەها؛ هەرپاسە: ١. هەر بەو جۆرە؛ هەر بەو چەشنە؛ هەر بەو تەرزە؛ هەرئەپاسە؛ هەرئاپاسە؛ هەر ئەپی جۆرە؛ هەر پی جۆرە؛ بەو جۆرە؛ بەو چەشنە ‹همچنان می‌خندید: هەروا پێدەکەنی› ٢. هێشتا؛ هێشتان؛ هێما؛ هێژ؛ هەلای ‹همچنان منتظر شماست: هەروا چاوەڕوانی ئێوەیە›.

**همچند** / hamčand/: صفت. بەرانبەر؛ بەرامبەر؛ بەرابەر؛ هەمبەر؛ هەڤبەر؛ هاوهەند.

**همچندی** / hamčandî/: اسم. یەکسانی؛ بەرانبەری؛ بەرامبەری؛ بەرابەری؛ هەمبەری؛ وەک یەکی.

**همچنین**[1] / hamčenîn/: صفت. ئاوەها؛ ئاوا؛ ئەئاوا؛ ئەوەها؛ وا؛ وەها؛ ئی پیسە؛ پیسە؛ وەتۆ؛ وەسان؛ هۆتۆ؛ ولۆ؛ بەم جۆرە؛ بەم شێوە؛ بەم چەشنە ‹همچنین جایی نرفته بودم: ئاوەها جێگەیەک نەچووبووم›.

**همچنین**[2]: قید. هەروەها: ١. زیاد لەوەش؛ جگەلەمە؛ جگەلەمانە ‹علت دیگر عقب‌افتادگی جوامع، همچنین فقر است: هۆی تری دواکەوتوویی کۆمەڵگاکان، هەروەها هەژارییە› ٢. بەم چەشنە؛ بەم تەرزە؛ بەم جۆرە؛ هۆتۆ؛ وەتۆ؛ ولۆ ‹آزاد همیشه همچنین رفتار می‌کند که می‌بینی: ئازاد هەمیشە بەم چەشنە دەجووڵێتەوە وا چاوت لێیە›.

**همچنین**[3]: حرف. هەروەها؛ هەرپاسە؛ هەروا ‹همچنین، او را کمی نصیحت کنید: هەروەها نەختێ ئامۆژگاری بکەن›.

**همچو**[1] / hamčo/: صفت. [گفتاری] ئاوەها؛ ئاوا؛ ئاوها؛ ئەوها؛ ئەوەهە؛ وا؛ وەها؛ وەسا؛ هۆسا؛ وەکوو ئەم ‹پارسال همچو شبی برف آمد: پارەکە

ئاوەها شەوێک بەفر باری›.

**همچو**[2]: حرف. [مخفف] وەک؛ وەکوو؛ وێنەی؛ وەسە؛ وەسا ‹همچو گل خندەرو می‌باش: وەک گوڵ دەم‌بەپێکەنین بە›.

**همچون** / hamčûn/: حرف. [ادبی] وەکوو؛ هەر وەکوو؛ هەروەک؛ وەک؛ پێسەو؛ هەر پێسەو؛ پسۆ؛ وێنەی؛ وەک؛ وەکی؛ وەکا؛ وەکە ‹همچون مستان تلو-تلو می‌خورد: وەکوو سەرخۆشان لەتری دەدا›.

**همچین** / hamčîn/: قید. [گفتاری] وا: ١. ئەوەندە؛ ئەمەندە؛ ئەونە؛ ئانە ‹همچین خوب هم نبود: وا باشیش نەبوو› ٢. وەها؛ ئاوەها؛ پاسە ‹همچین که خون از دماغم آمد: وا لێمی دا خوێن لە لووتم بەر بوو› ٣. ئاوا؛ پێسە ‹وا! چرا همچین می‌کنی دختر؟: ئەیەڕۆ! کچێ! بۆ وا دەکەی؟›.

◘ **همچین که**: هەر کە؛ هەر؛ کە ‹همچین که می‌خواست بنشیند فریادش بلند شد: هەر کە ویستی دانیشێ هاواری بەرزەوە بوو›.

**هم‌خانواده** / hamxānevāe ، ـها/: صفت. هاوخێزان: ١. بە یەک بنەماڵەوە ٢. هاوچەشن؛ هاودەسە؛ هاودەستە؛ سەر بە یەک تاقم و دەستەوە ‹رنگهای هم‌خانواده: ڕەنگگەلی هاوچەشن› ٣. [دستور] تایبەتمەندی دوو یان چەند وشە کە ڕیشەیان یەکێکە (وەک «زانا»، «زانیار» و «زانستگا»).

**همخرج** / hamxarc ، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. هاوخەرج؛ هامخەرج؛ هەرکام لە ئەندامانی تاقمێک (وەک هاوسەفەر) کە بەشەپارەی خۆی دەدا و ئیدی هەر چێ هەبێ و بکرێ بۆ هەموو وەکوو یەکە.

**همخواب** / hamxāb/: صفت. هاوبەر؛ هاونشێو؛ بە لێژایی لە یەک باردا.

**همخوابگی** / hamxābegî/: اسم. ١. کار و ڕەوتی خەوتنی ژن پیاو پێکەوە ٢. [مجازی] دروستبوون؛ هاونوێنی؛ هاوسەرینی؛ سەرجێیی.

**همخوابە** / hamxābe ، ـها/: اسم. هاونوێن؛ هاوخەو؛ هام‌خەو؛ هەمخەو؛ هاوجووت؛ ژن یا پیاوێ کە بۆ سەرجێیی لەگەڵ پیاو یان ژنێکدا ڕادەکشێ.

**همخوان**[1] / hamxān ، ـها/: اسم. [زبان‌شناسی] کپ؛ بێ‌دەنگ؛ نەبر؛ پیتێک کە کاتی دەربڕین، هەناسە بۆڕ دەخوا (وەک ب، پ، م و...).

**همخوان**[2]: صفت. ١. جۆر؛ سازگار؛ ڕێک؛ تەبا؛ لێک‌نزیک ‹این دو رنگ با هم همخوان نیستند: ئەم دوو ڕەنگە پێکەوە جۆر نین› ٢. واخوێن؛ هاوئاواز ‹گروه همخوان: تاقمی واخوێن›.

**همخوانی** / hamxānî/: اسم. ١. بەرهەنگاری؛ کار یان ڕەوتی شباندن؛ هاتنەوە بەر چاو؛ بە بۆنەی شتێکەوە، شتێکی تر وەبیر هاتنەوە ٢. لێک‌نزیکی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی لێک کالانەوە ‹این دو موضوع با یکدیگر همخوانی ندارند: ئەم دوو بابەتە لێک ناکالنەوە› ٣. [زبانشناسی] دۆخ یان چۆنیەتی کپ/ بێ‌دەنگ بوون.

**همخون** / hamxûn ، ـها/: صفت. هاوخوێن؛ هەڤخون: ١. بە گرۆیەکی خوێنی وەک یەکەوە ٢. بە پێوەندی خزمایەتی زۆر نزیک (دایکی، باوکی، خوشکی، برایی یان زارۆکی).

**همخونی** / hamxûnî/: اسم. هاوخوێنی: ١. خزمایەتی؛ قەومایەتی (بەتایبەت هاوپشتی) ٢. دۆخ یان چۆنیەتی هاوگرۆی خوێنی بوون.

**همداستان** / hamdāstān/: صفت. [مجازی، ادبی] هاوڕا؛ هاوڕێباز؛ بە بڕوا و بڕیارێکی هاوبەشەوە ‹آنان در مبارزه با قدرت استبدادی همداستان بودند: ئەوان لە خەبات دژی هێزی چەوسێنەردا هاوڕا بوون›.

**همداستانی** / hamdāstānî/: اسم. [مجازی، ادبی] هاوڕایی؛ هاوڕێبازی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هاوڕا بوون.

**همدرد** / hamdard/: صفت. هاودەرد؛ هەمدەرد؛ هەڤدەرد؛ هامدەرد؛ تایبەتمەندی دوو یان چەند

کەس کە دەرد، نەخۆشی یان تووشیاریەکی وەک یەکیان هەیە ‹همه همدرد بودند و درد غریبی را می‌شناختند: هەموو پێکەوە هاودەرد بوون و هەستیان بە دەردی غەریبی دەکرد›.

**همدردی** / hamdardî ، ـها/:اسم. هاودەردی؛ هەمدەردی؛ هەڤدەردی؛ هامدەردی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی هاودەرد بوون ‹همدردی آنها موجب آشناییشان شد: هاودەردیان بوو بە هۆی ئاشنایەتیان› ٢. [مجازی] هاوخەمی؛ هاوخەفەتی؛ کار یان ئاکاری بە نیشانەی بە دەردی خەڵکەوە سووتان و هەوڵ دان بۆ یارمەتیان ‹با او همدردی کرد و کوشید به طریقی از رنج و اندوه او بکاهد: هاودەردی دەگەڵدا کرد و هەوڵی دا هەر چۆنێک بووە باری خەم و مەینەتی سووک کا›.

**همدرس** / hamdars ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] اسم. هاودەرس؛ ئامدەرس؛ هاواڵدەرس؛ هامدەرس؛ هاوقوتابی؛ دوو کەس کە پێکەوە لە شوێنێک و لە یەک بابەت خوێندوویانە ‹می‌گویند مولوی و نالی در دارالاحسان همدرس بودند: دەڵێن مەولەوی نالی لە دارولئیحساندا هاودەرس بوون›.

**همدست** / hamdast ، ـها؛ ـان/:اسم. [مجازی] ١. هاوقۆڵ؛ هاودەست؛ ئەوانەی پێکەوە لە کارێکی زۆرتر ناڕەوادا هاوکارن ٢. هاوبازوو؛ هاوکار؛ بەردەست؛ دەسیار.

**همدستی**/ hamdastî/:اسم. [مجازی] هاودەستی؛ هاودەسی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هاودەست بوون لە کارێکی ناڕەوادا.

**همدل** [1] / hamdel ، ـان/:اسم. هاودڵ؛ هەڤدل؛ هاوئاوات؛ ئەوانەی دڵیان بۆ یەک دێنی ‹در آن جمع یک همدل نداشت: لەو کۆڕەدا هاودڵێکی نەبوو›.

**همدل** [2]: صفت. هاودڵ؛ هەڤدل؛ بە هەست و وازی دۆستانەوە ‹اگر با من همدل بودی، دردم را می‌فهمیدی: ئەگەر هاودڵم ببای، لە دەردم تێدەگەیشتی›.

**همدلی** / hamdelî ، ـها/:اسم. ١. هاودڵی؛ هامدڵی ٢. هاوبیری؛ لە یەک تێگەیشتوی.

**همدم** / hamdam ، ـها/:اسم. [مجازی] هاودەم؛ هەڤاڵ؛ هاواڵ؛ هەمدەم؛ ڕێهەڤ؛ هەڤدەم؛ هەڤدەڤ؛ ئاودەم؛ هەڤدەنگ: ١. خەم ڕەوێن؛ کەسێ کە لەگەڵی دانیشتن و قسەکردن سووکناییدەرە: **همنفس** ٢. ئاودەنگ؛ خەمڕەوێن؛ ئەو شتەی (وەک کتێب یان ئاژەڵیماڵی) کە مرۆ لە تەنیایی دەردێنێ ٣. هەڤنشین؛ هاوقسە؛ ڕەفیق.

**همدما** / hamdamā/:اسم. هاودەما: ١. هێڵێک لە سەر نەخشەی گۆێ زەوین کە شوێنە یەکدەماکان پێکەوە دەلکێنێ ٢. هێڵێک لە سەر نەخشە کە ئاڵوگۆڕی بارستایی یان تەوژم لە دەمایەکدا نیشان دەدا.

**هم‌دندان** / hamdandān ، ـها/: صفت. [مجازی، گفتاری] هاوڕیش؛ هاوتەمەن و خاوەن دۆخێکی وەکوو یەک (زۆرتر بۆ بەسالاچوون دەگوترێ).

**همدوره** / hamdowre, hamdo:re ، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. هاودەورە؛ هاوقەتار؛ ئەوانەی پێکەوە بەشداری دەورەیەک بوون ‹همدوره‌ی سربازی: هاودەورەی سەربازی›.

**همدوره‌ای** / hamdowre'î, hamdo:re'î ، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. هاودەورەیی؛ هاودەورەیی؛ ‹با همدوره‌ی خودش ازدواج کرد: دەگەڵ هاودەورەیەکی خۆیدا زەماوەندی کرد›.

**همدوش** [1] / hamdûš/: صفت. هاوشان؛ هاوتەراز؛ هاوپەرا؛ هەمبەر؛ هنکووف؛ هاوکووف؛ هەمپلە؛ بە پلە و پایە و جێگایەکی بەرامبەرەوە.

**همدوش** [2]: قید. شانبەشان؛ پاڵبەپاڵ؛ لەشان؛ هاوڕیز؛ لە ڕیز ‹همدوش هم حرکت کردند: شانبەشانی یەک ڕۆیشتن›.

**همدیگر** / hamdîgar/: ضمیر. یەکتر؛ یەکتری؛ یەکترین؛ ئێکتر؛ هەڤدوو؛ هەڤدی؛ هەدو؛ یۆترین؛ هەنترین؛ یەونا ‹همدیگر را دوست داشتند:

یەکتریان خۆش دەویست›.

**همدین / hamdîn/**: *صفت.* هاودین؛ هەمدین؛ هەڤدین؛ هەڤۆل.

**همراز / hamrāz ، ـها/:** *اسم.* هاوراز؛ هەمراز؛ ئاوراز؛ هامراز؛ ئامراز؛ هاوسر: ١. ئەوانەی پێکەوە رازێکی شاراوەیان هەیە ٢. ئەوانەی تەنیا رازی خۆیان بە یەکتر دەڵێن ‹همرازی یافته بودم و می‌توانستم راز خود را با او در میان بگذارم: هاورازێکم دیتبۆوەوە و دەمتوانی نهێنی دڵی خۆمی بە لاوە بێژم›.

**همراه[1] / hamrāh ، ـان/:** *اسم.* هاوڕێ؛ هاورا؛ هەمرا؛ هامرا؛ ئامرا؛ هارا؛ هەڤرێ؛ هەڤری؛ دۆس؛ هەورێ؛ هەڤرێک؛ ڕەفێق؛ ڕەفێقواری؛ ڕەفیقی ڕێگە؛ کەسێ کە لەگەڵ یەکێکی تردایە ‹همراه او مردی لاغراندام بود: هاوڕێکەی پیاوێکی باریکەڵە بوو›.

**همراه[2]:** *صفت.* هاوڕێ: ١. بە یەک ڕێگە و بزاڤی هاوبەشەوە ‹تا ارومیه همراه بودیم: تا ورمێ هاوڕێ بووین› ٢. بە یەک ئامانج و باوەڕی هاوبەشەوە ‹آن دو همدل و همراه بودند: ئەو جووتە هاودڵ و هاوڕێ بوون›.

▣ **همراه شدن:** بوونە هاوڕێ؛ پێکەوە ڕۆشتن ‹با چند نفر همراه شدیم و یک ماشین دربست کرایه کردیم: لەگەڵ چەند کەسدا بووینە هاوڕێ و ماشێنێکی دەربەستمان گرت›.

**همراه کردن:** کردنە هاوڕێ؛ لەگەڵ خستن: ١. لەگەڵ ناردن؛ پێکەوە ناردن ‹برادرزاده‌اش را هم همراه او کرد: برازاکەشی لەگەڵ نارد› ٢. دانە پاڵ؛ خستنە پاڵ؛ پێکەوە بەستن؛ بە شتێک ئیزافە یان پەیوەستکردن ‹گریه و ناله‌اش را مدتی است با دشنام و نفرین همراه کرده است: ماوەیەکە گریان و ناڵەکەی داوەتە پاڵ تووک و جنێوەوە›.

**همراه[3]:** *قید.* دەگەڵ؛ لەگەڵ؛ ڕەگەڵ؛ چنی؛ چەنی؛ لەتەک؛ لەیەل ‹شناسنامه یا کارت شناسایی همراه داشته باشید: ناسنامە یان کارتی پێناسەتان دەگەڵ بێ›.

▣ **همراه بردن:** لەگەڵ خۆدا بردن؛ لە تەک/ لەیەل خۆ بردن؛ ڕەگەڵ خۆ خستن ‹او را هم همراه بردم بلکه کمکم باشد: ئەویشم لەگەڵ خۆدا برد بەڵکوو یاریدەم بێ›.

**همراه داشتن:** پێ بوون؛ لەگەڵ بوون؛ لە تەک بوون؛ پنە/ پەنە بیەی ‹قدری پول همراه داشتم: هێندێ پارەم پێبوو›.

**همراه / hamrāhe/:** *حرف.* لەتەک؛ لەیەل؛ دەگەڵ؛ لەگەڵ؛ دگەڵ؛ ڕەگەڵ؛ پێڕا؛ تەبا؛ ڤێدا؛ ڤێدە؛ چەنی؛ چنی؛ پێڕ؛ گەرد؛ وەگەرد؛ وە؛ واز؛ وێڕا؛ وەل؛ وەرد ‹همراه مادرش بود: لەتەک دایکیا بوو›.

**همراهی / hamrāhî ، ـها/:** *اسم.* هاوراییی؛ هاوڕێیی؛ هامرایی؛ یەورایی؛ هەمرایی؛ هاوڕێیەتی: ١. کاری دەگەڵ کەوتن؛ خۆ خستنە تەک کەس یان شتێ ‹او را تا بیمارستان همراهی کرد: تا نەخۆشخانە هاورایی کرد› ٢. *[مجازی]* یارمەتی؛ کومەک ‹همسایه‌ها هم همراهی کردند: دراوسێکانیش هاوڕێییان کرد› ٣. کار یا ڕەوتی بەشداری کردن لە کارێکدا ‹نوای ویلن خواننده را همراهی می‌کرد: دەنگی ویولون گۆرانیبێژەکەی هامرایی دەکرد›.

**همردیف[1] / hamradîf ، ـها/:** [فارسی/ عربی]*/اسم.* هاوشان؛ هاورزن؛ کارمەندی بێچەکی ئەرتەش کە پلە یان پایەیەکی دیاریکراوی هەیە ‹همردیف سرهنگ: هاوشانی سەرهەنگ›.

**همردیف[2]:** *صفت.* هاوریز؛ هاورزن ‹صندلیهای ما همردیف بود: سەندەلیەکانمان هاوریز بوون›.

**همرزم / hamrazm ، ـها؛ ـان/:** *اسم.* هاوخەبات؛ هاوجەنگاوەر؛ هاوشەڕ؛ ئەوانەی لە شەڕ و ململانەیەکدا لە پەنا یان هاوکاری یەکن.

**همرس / hamras/** ☜ **هَمگرا**

**همرنگ / hamrang/:** *صفت.* هاوڕەنگ؛

هەمڕەنگ؛ هامڕەنگ؛ هەڤڕەنگ؛ یەکڕەنگ: ۱. بە ڕەنگی یەکسان ۲. *[مجازی]* هەماهەنگ و یەکسان ‹همرنگ جماعت: هاوڕەنگی خەڵک›.

**همرو** / hamrow ، همروان/: *اسم.* پارێزەر؛ پارێزڤان؛ ئیسکۆرت.

**همروی** / hamrovî/: *اسم.* پارێزەری؛ پارێزڤانی؛ ئیسکۆرت.

◘ همروی کردن: پاراستن؛ پارێزگاری کردن.

**همروند** / hamravand/: *صفت.* هەمەلایەنە؛ بە یەک تایبەتمەندی و لە هەموو بار و لایەنێکدا.

**همریختی** / hamrîxtî/: *اسم.* ۱. *[زیست‌شناسی]* وێکچوویی دە نێوان ئەو ژیوەرانەی لە یەک پشت نەبوونەتەوە ۲. *[کانی‌شناسی]* وێکچوویی بیچمی بلۆرینی شتگەلێ کە دارشتەگەلیان لە یەک دەچن ۳. *[شیمی]* وێکچوویی دە نێوان شکڵی بلۆرینی پێکهاتەگەلی جۆراوجۆردا ٤. *[ریاضی]* دەقاودەقی یەک بە یەکی نێوان ئەندامانی دوو کۆکراوەی بیرکاری.

**همریش** / hamrîš ، ـها/: *اسم.* *[مجازی]* هاوزاوا؛ ئاوەڵزاوا؛ هاوەڵزاوا؛ هەڤاڵزاوا؛ هەڤزاڤا؛ هاوزەو؛ هەڤلنگ؛ ئەو پیاوانە ژنەکانیان خوشکن.

**همزاد** / hamzād ، ـان/: *اسم.* ۱. *[فرهنگ‌مردم]* هاوسک؛ بوونەوەرێکی خەیاڵی (وەک جنۆکە) کە وا بیر دەبەن لەگەڵ کەسێکدا دێتە دنیا و تا دوایین کاتی ژیانی لەگەڵیدایە ۲. ئاواڵدوانە؛ هاواڵدوانە؛ لفەدووانە؛ جمک؛ جوی؛ هامزا؛ دوانە؛ لف؛ لفە.

**همزبان** / hamzabān/: *صفت.* هاوزمان؛ هاوزوان؛ هامزوان؛ هەمزوان؛ هەڤزمان؛ هەڤزار؛ یەکزمان؛ بە تایبەتمەندی یەک بوونی زمانی زگماک.

**همزبانی** / hamzabānî/: *اسم.* ۱. هاوزمانی؛ هاوزوانی؛ هامزوانی؛ هەڤزمانی؛ دۆخی یەک بوونی زمانی زگماک ۲. *[مجازی]* هاودڵی؛ هاوبیری؛ هاوڕێیی؛ هاوفکری؛ دۆخی توانایی لێک تێگەیشتن و هەبوونی بیر و بۆچوونی وەک یەک ۳. قسە بە یەک زمان.

**همزمان**[۱] / hamzamān/: *صفت.* هاوکات؛ هاوزەمان؛ هاوچەرخ؛ هامزەمان؛ لە یەک کاتدا ‹حرکت همزمان: بزاڤی هاوکات›.

**همزمان**[۲]: *قید.* هاوکات؛ هاوزەمان؛ هەمزەمان ‹تولد او همزمان بود با عروسی خواهرم: لە دایک بوونی هاوکات بوو دەگەڵ زەماوەندی خوشکمدا›.

**همزمانی** / hamzamānî/: *اسم.* هاوچەرخی؛ هاوکاتی؛ هاوزەمانی. بەرانبەر: **درزمانی**

**همزن** / hamzan ، ـها/: *اسم.* کەرستەیەک بۆ تێکەڵاوکردنی چەن ماکی خۆراکی (پتر تراو).

**همزنجیر** / hamzancîr ، ـان/: *صفت.* *[مجازی]* هاوبەند؛ هاوزیندانی ‹او در زندان اوین با جمعی از مخالفان خود همزنجیر بود: ئەو لە زیندانی ئیویندا وێڕای کۆمەڵێک لە نەیارانی هاوبەند بوون›.

**همزه** / hamze ، ـها/: [عربی] *اسم.* *[دستور]* هەمزە؛ پیتی بێدەنگی «ء».

**همزی** / hamzî ، ـان/: *صفت.* هاوژی؛ بە ژیانێکی هاوبەش دەگەڵ کەس یان کەسانیتردا.

**همزیستی** / hamzîstî ، ـها/: *اسم.* هاوژینی: ۱. *[سیاست]* ژیانی چەن کەس، تاقم یان گەل لە لای یەکتر، بەتایبەت لە دۆخێکی ئارام و هێمندا ۲. *[زیست‌شناسی]* ژیانی دوو یا چەن ژیوەری جیاواز لەگەڵ یەکتر.

**همساز** / hamsāz ، ـها/: *صفت.* ۱. سازگار؛ سازیار ۲. هەماهەنگ؛ هاودەنگ؛ هاوئاهەنگ.

**همسال** / hamsāl ، ـان/: *صفت.* هاوتەمەن؛ هاوسال؛ هەمسال؛ هامسال؛ هاوتیرە؛ هامتیرە؛ هاوسن؛ هاوسەر؛ هاومال؛ هاوعومر؛ هاوزا؛ هاوزگە؛ هاوزێ؛ لە تەمەندا بەرانبەر.

**همسان** / hamsān ، ـها/: *صفت.* یەکدەست؛ وێکچوو؛ لێکچوو؛ بە یەک ئەندازە و شکڵ ‹لباس همسان: جلی یەکدەست›.

**همسانه** / hamsāne ، ـها/: *اسم.* یونیفورم؛ جلوبەرگی یەکجۆری دەستەیەک.

**همسانی** / hamsânî ، ـها/:اسم. وەکیەکی؛ وێکچوویی؛ لێکچوویی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هاوچەشن بوون.

**همسایگی** / hamsâyegî/:اسم. هاوسایەتی؛ جیرانەتی؛ هاوسایی؛ هامسایی؛ دەراوسێیی؛ هەڤسیایی؛ هاوسێتی؛ هاوسێیی؛ هامسایەتی: ۱. هامساگەری ‹به آزاد گفتم این رسم همسایگی نیست: بە ئازادم گوت ئەمە شێوەی هاوسایەتی نیە› ۲. جێگە و شوێنی دراوسێ ‹در همسایگی ما زندگی می‌کرد: لە هاوسایەتی ئێمەدا دەژیا›.

**همسایه**[1] / hamsâye ، ـها/:اسم. هاوسا؛ هامسا؛ هەمسا؛ هاوسێ؛ دەراوسێ؛ ئاوسا؛ هەڤسیا؛ هاشووشە؛ دراوسێ؛ جیران: ۱. ـگان/ هەڤمال؛ دو یا چەند کەس کە ماڵ یان شوێنی کاریان لەپاڵ یەکدایە ‹ده سال است همسایه‌ایم: دە ساڵە هاوساین› ۲. دوو یا چەند شوێن کە لە پاڵ یەکتردان ‹ ایران و عراق همسایه‌اند: ئێران و عیراق هاوسێن›.

▣ همسایەی دیوار بە دیوار: ئاوماڵ؛ هاوماڵ؛ ئاوماڵە؛ ماڵەهاوسا؛ ماڵاوسا؛ ئوماڵە؛ هەڤسێ؛ دراوسێ؛ هەمسا؛ هاوسای درگا بە درگا؛ هامسای بەرە و بەرە ‹ما سالها همسایەی دیوار بە دیوارشان بودیم: ئێمە چەنای چەن ساڵ ئاوماڵیان بووین›.

**همسایه**[2]: صفت. دراوسێ؛ هاوسێ؛ هاوسا؛ هامسا؛ هەمسا؛ ئاوسا؛ هاشووشە؛ هاوسایە؛ ئاوسا؛ جیران ‹کشور همسایه: وڵاتی دراوسێ›.

**همسخن** / hamsoxan ، ـان/: صفت. [ادبی] هاوقسە: ۱. هاوباس؛ هەڤپەیڤ؛ هاووتە؛ هاوویتە ۲. [مجازی] هاوبیر؛ هاوڕا؛ هاوبڕیار؛ هاوڕێباز.

**همسخنی** / hamsoxanî/:اسم. هاوقسەیی؛ هاوڕایی.

**همسر** / hamsar ، ـها؛ ـان/:اسم. هاوسەر؛ هامسەر؛ هەڤسەر؛ هەمسەر؛ جووت؛ جفت؛ هاوجووت؛ ئاوجووت؛ هامجووت؛ هامجفت؛ هاوسەرین؛ هاوژین؛ مەحرەم؛ لف؛ ولف؛ هاونیلە؛ هەڤخەو؛ مێردی ژن یان ژنی پیاوێک.

**همسرا** / hamsorā ، ـیان/:اسم. کۆمبێژ؛ هەرکام لە ئەندامانی کۆڕێ خوێندنی بە کۆمەڵ.

**همسرایان** / hamsorāyān/:اسم. کۆمبێژان؛ دەستەی کۆڕ؛ کۆڕی گۆرانیبێژان کە سروود یان گۆرانیەک پێکەوە و بە ئورکێستر دەخوێنن.

**همسرایی** / hamsorāyî ، ـها/:اسم. کۆمبێژی؛ گۆرانی خوێندنەوە بە کۆڕ: کُر

**همسرگزینی** / hamsargozînî/:اسم. هاوسەربژێری؛ لفگیری؛ کار و ڕەوتی ژن خواستن (بۆ کوڕ)؛ شووکردن (بۆ کچ) ‹مراسم همسرگزینی در تمدنهای مختلف: ڕێورەسمی هاوسەربژیری لە ژیارە جۆراوجۆرەکاندا›.

**همسری** / hamsarî/:اسم. ۱. هاوسەری؛ هامسەری؛ وەلیفەتی؛ پەیوەندی مێرد و ژن بە یەکترەوە ‹به همسری انتخاب کردن: بۆ هاوسەری هەڵبژاردن› ۲. [مجازی] کێبەرکێ؛ ڕقەبەری؛ ململانێ.

▣ به همسری خود درآوردن: کردنە هاوسەری خۆ؛ کردنە ژنی خۆ؛ خوازتن؛ هێنان؛ ئاردەی ‹دختری را به همسری خود درآورد: کچێکی کردە هاوسەری خوی›.

**همسریابی** / hamsaryābî/:اسم. هاوسەردۆزی؛ کار و ڕەوتی دۆزینەوەی هاوسەر بۆ ژیان.

**همسطح** / hamsath/: [فارسی/ عربی] صفت. هاوئاست؛ هاوتەراز؛ هامتەراز: ۱. هەمبەر ‹این بام با آن یکی همسطح است: ئەو سەربانە لەگەڵ ئەویتردا هاوئاستن› ۲. هاوشان؛ ئاوشان؛ هاوکۆف؛ هەنکوف؛ هاوپلە و پایە؛ بە بار و دۆخ یان پلەیەکی یەکسانەوە.

**همسفر** / hamsafar ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی]/اسم. هاوڕێ؛ هاوسەفەر؛ هامسەفەر؛ ئامڕا؛ هامڕا ‹همسفرم برگشت و به من گفت: مواظب کیفت باش!:

هاوڕێکەم لای کردەوە پێمی گوت: وریای کیفەکەت بە!›.

**همسفرگی** / hamsofregî/: *اسم.* هاوسەفەرەیی؛ هاوخوانی؛ هاوجەمی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هاوخوان بوون.

**همسفره** / hamsofre، ـها/: *صفت.* هاوخوان؛ هاوسفرە؛ هاوجەم؛ هامسفرە: ١. تایبەتمەندی دوو یان چەند کەس کە لە یەک شت دەخۆن ٢. *[زیستشناسی]* بە سەرچاوەی خۆراکی هاوبەشەوە.

**همسلول** / hamsellûl/: *صفت.* [فارسی/ فرانسوی] هاوسیللوول؛ تایبەتمەندی دوو یان چەند کەسی بەندی کە لە ژووریکدان.

**همسن** / hamsen/: [فارسی/ عربی] *صفت.* هاوسال؛ هاوتەمەن؛ هامڤەر؛ بەژا؛ هاوزا؛ هاوباز؛ هومدا؛ هاوعومر.

**همسنگ** / hamsang/: *صفت.* *[مجازی]* هاوسەنگ؛ هامسەنگ؛ هاوپەرا؛ هاونرخ؛ بە قورسایی یان بایەخی وەک یەکەوە.

**همسنگر** / hamsangar/: *صفت.* هاوسەنگەر؛ هامسەنگەر؛ هاوخەڵ؛ هاومەتەریز؛ پاڵبەپاڵی یەک لە مەیدانی شەڕدا.

**همسو** / hamsû، ـها/: *صفت.* هاولا: ١. بەرەو یەک لا ٢. ـیان/ هاودەنگ؛ هامدەنگ؛ هاوبیر؛ بە بۆچوونی وەک یەکەوە.

**همسوئی** / hamsû'î/ ☜ **همسویی**

**همسود** / hamsûd/: *صفت.* هاوقازانج؛ هاوبەرژەوەند؛ بە قازانجی هاوبەش دەگەڵ کەس یان کەسانی دیکەدا.

**همسویی** / hamsûyî/: *اسم.* هاولایی؛ هاوبیری؛ هاوئاهەنگی؛ هاودەنگی: **همسوئی**

**همشاگرد** / hamšāgerd، ـها؛ ـان/: *صفت.* هاوپۆل؛ هاوکلاس.

**همشاگردی** / hamšāgerdî، ـها/: *اسم.* هاوپۆلی؛ هاوکلاسی؛ هاوقوتابی.

**همشکم** / hamšekam، ـان/: *صفت.* *[مجازی]* هاوسک؛ هاوزگ؛ هەڤزا؛ هاوزا؛ لفەدووانە؛ ئاوەڵدوانە؛ دوانە؛ جمک؛ جوی؛ هامزا؛ لف؛ لفە؛ لە یەک دایک و پێکەوە وەدنیا هاتوو.

**همشهری**[1] / hamšahrî، ـها؛ ـان/: *اسم.* هاوشاری؛ هەمشاری؛ هاوولاتی؛ هەڤجی؛ هاموەلاتی؛ هاموەلایەتی؛ هاووەلایەتی؛ هەمباژاڕی؛ هەمباژێری؛ هەڤشاری؛ هاوزێد: ١. ئەوانەی لە شارێکدا دەژین ٢. ئەوانە وا شاری لە دایک بوونیان یەکێکە ‹یک همشهری به دادمان رسید: هاوشاریەک فریامان کەوت›.

**همشهری**[2]: *صفت.* هاوولاتی؛ هاوشاری؛ هامشاری؛ هاموەلاتی؛ هاموەلایەتی؛ هەمباژاڕی؛ هەڤباژێری؛ هەمباژێری؛ بە شاری لە دایک بوونی یەکسانەوە ‹رانندە همشهری ما بود: شۆفێرەکە هاوشاریمان بوو›.

**همشیب** / hamšîb/: *صفت.* هاونشێو؛ هاوبەر؛ بە لێژایی لە یەک باردا.

**همشیره** / hamšîre، ـها؛ ـگان/: *اسم.* خۆشک؛ خوشک؛ خۆیشک؛ خوەیشک؛ خوار؛ واڵێ.

**همشیره‌زاده** / hamšîrezāde، ـها؛ ـگان/: *اسم.* خوشکەزا؛ خوەیشکەزا؛ خوەیشکەزاگ؛ وارەزا؛ والەزا؛ خوارزا؛ منالی خۆشک.

**همصحبت** / hamsohbt/: [فارسی/ عربی] *صفت.* هاوقسە؛ هامقسە؛ هاودەم؛ هامدەم.

**همصحبتی** / hamsohbatî/: [فارسی/ عربی] *اسم.* هاوقسەیی؛ هاودەمی؛ هامقسەیی؛ هاودەمی ‹از همصحبتی با دیگران پرهیز داشت: لە هاوقسەیی خەڵک خۆی دەپاراست›.

**همصدا** / hamsedā/: [فارسی/ عربی] *صفت.* هاودەنگ؛ هامدەنگ؛ یەکدەنگ: ١. بە دەنگێکی هاوئاهەنگ دەگەڵ دەنگی کەسانی دیکەدا ‹او هم با ما همصدا شد: ئەویش دەگەڵمان هاودەنگ بوو› ٢. *[مجازی]* هاوبیر؛ بە بۆچوونی وەک یەک لەگەڵ کەس یان کەسانیتردا.

**همصـدائی** / hamsedā'î/: [فارسی/ عربی] ☜ **همصدایی**

**همصدایی** / hamsedāyî/: [فارسی/ عربی]/اسم. هاودەنگی؛ هامدەنگی؛ یەکدەنگی؛ هاوبیری: ١. دۆخ یان چۆنیەتی یەکدەنگ بوون دەگەڵ کەسانی دیکەدا ٢. کار و ڕەوتی قسەکردن یان دەنگ هەڵدان بە مەبەستی چەسپاندنی قسەی کەس یا کەسانی دی * **همصدائی**

**همصـفحه** / hamsafhe/: [فارسی/ عربی] صفت. هاولاپەڕە؛ هاوپەڕە؛ جێگرتوو لە یەک لاپەڕەدا.

**همطـراز** / hamtarāz/: [فارسی/ معرب] ☜ **همتراز**

**همعصر** / ham'asr، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. هاوچەرخ؛ هاوچاخ؛ هاوزەمان؛ هاوبەرە؛ هاوڕۆژگار؛ هەڤبەر؛ هەڤچاخ؛ هەڤدەم؛ هەڵکەوتوو لە یەک کاتدا.

**هم‌عقیده** / ham'aqîde/: [فارسی/ عربی] صفت. هاوبیروڕا؛ تایبەتمەندی دوو یان چەند کەس بە بیر و بۆچوونی وەک یەکەوە.

**همفشار** [1] / hamfešār، ـها/: اسم. [هواشناسی] هاوتەوژم؛ هێڵێکی سەر نەخشەی گۆی زەوی کە شوێنە هاوتەوژمەکان دەباتەوە سەر یەک.

**همفشار** [2]: صفت. [شیمی] هاوتەوژم؛ هاوفشار؛ بە قورسایی یان جرمی ئەتۆمی یەکسان و ژمارەی ئەتۆمی جیاوازەوە.

**همفکر** / hamfekr، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. هاوبیر؛ هاوفکر؛ هامفکر؛ هاوڕا؛ هاوبیروڕا؛ هاودەنگ؛ هامویر؛ هامڕا؛ هاوباوەڕ؛ هامباوەڕ؛ هەڤدەنگ؛ ئاودەنگ؛ هاوقسە؛ یەکدەنگ؛ هاوهزر ‹ما با هم همفکریم: ئێمە پێکەوە هاوبیرین›.

**همفکری** / hamfekrî، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. هاوڕایی؛ هامڕایی؛ یەکڕایی؛ هاوبیری؛ هاوفیکری؛ هامدەنگی؛ ئاودەنگی؛ هەڤدەنگی؛ یەکدەنگی؛ هاوباوەڕی؛ هاوقسەیی؛ هامقسەیی ‹با همفکری هم نقشەاش را کشیدیم: بە هاوڕایی یەکترەوە نەخشەکەیمان کێشا›.

**همقدم** / hamqadam، ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. هاوقەدەم؛ هاوقام؛ هاوهەنگاو؛ هاوڕێ؛ بە ڕێباز و ئامانجی یەکسانەوە.

**همقدمی** / hamqadamî، ـها/: [فارسی/ عربی]/اسم. هاوقەدەمی؛ هامقەدەمی؛ هاوقامی؛ هاوهەنگاوی.

**همقسم** / hamqasam، ـان/: [فارسی/ عربی] صفت. هاوپەیمان؛ هاوسوێند؛ هاوبڕیار؛ هاوسوێن؛ هاوبەڵێن؛ هاوسۆند؛ هاوسۆز ‹همقسم شدند که به هم خیانت نکنند: هاوسوێند بوون کە خەیانەت بە یەک نەکەن›.

**همقطـار** / hamqatār، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی]/اسم. هاوقەتار: ١. هاودەورە؛ چەند چەکداری خاوەن پلەوپایەی وەک یەک ‹سرگرد احمدی همقطار ما بود: سەرگورد ئەحمەدی هاوقەتارمان بوو› ٢. هەرکام لە دوو یان چەند سەرباز، دەرەجەدار یان ئەفسەر ٣. [مجازی] هاوسەنگ؛ کەسێکی خاوەن بە هەمان پلە و پایەی کۆمەڵایەتییەوە ‹آدم باید با همقطار خودش نشست و برخاست کند: مرۆ دەبێ دەگەڵ هاوسەنگی خۆی هەستان و دانیشتانی بێ›.

**همقلم** / hamqalam، ـان/: [فارسی/ معرب]/اسم. هاوقەڵەم؛ هاوکاری نووسەر؛ هەرکام لە دوو یان چەند نووسەری هاوکار، بەتایبەت ڕۆژنامەوان.

**همکار** / hamkār، ـها؛ ـان/: اسم. هاوکار؛ هامکار؛ هەمکار؛ هاوپیشە؛ هەڤکار؛ هەڤبەند؛ بەرکەیە؛ ئاریکار: ١. ئەوانەی بە یەک کارەوە خەریکن ٢. ئەوانەی لە شوێنێکدا کار دەکەن ٣. ئەوانەی کار و پیشەیان لە یەک دەچێ.

**همکـاری** / hamkārî، ـها/: اسم. هاوکاری؛ هامکاری؛ هەمکاری؛ هەڤکاری: ١. هاوپیشەیی؛ دۆخ یا چۆنیەتی هاوکار بوون ٢. دۆخ یان چۆنیەتی دارا بوونی کارێکی وەکوو یەک ٣. بەشداری چەن کەس لە کارێکدا

٤. ئاریکاری؛ هاریکاری؛ ئامیاری؛ یارمەتی؛ یاریدەری؛ هەڤبەندی.

**همکاسه** / hamkāse ، ـها/: [فارسی/ از عربی] *صفت.* هاوکاسە؛ هاوبایە: ١. هەرکام لە دوو یان چەند کەسێک کە لە دەفرێک چێشت دەخۆن ٢. *[مجازی]* بە سەرچاوە داهاتێکی هاوبەشەوە ‹من نمی‌خواهم در این شرکت با آدمهایی مثل او همکاسه بشوم: من گەرەکم نیە لەم بەشدارگەیە، لەگەڵ بنیادەمی وەکوو ئەودا هاوکاسە بم› ٣. هەواڵ؛ هاڤاڵ؛ برادەر.

**همکرد** / hamkard/ ☜ فعل همکرد، **فعل**

**همکشش** / hamkešeš ، ـها/: *صفت. [شیمی]* هاوفشار؛ هاوتەوژم.

**همکف** / hamkaf/: [فارسی/ عربی] *صفت.* ١. هاوئاست؛ لە باری بەرزی و نزمی، ڕێکی یەکێکی‌تر ٢. طبقەی همکف ☜ **طبقه**

**همکلاس** / hamkelās ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ فرانسوی] *صفت.* هاوپۆل؛ هاودەرس؛ ئاواڵ‌دەرس؛ هاوکلاس: ١. خاوەن قۆناغێکی دەرسی یەکسان ‹سارا و دارا همکلاس هستند: سارا و دارا هاوپۆلن› ٢. هاوقوتابی؛ لە یەک کەلاسی دەرسدا ‹هر دو همکلاس بودیم و روی یک میز می‌نشستیم: هەردووکمان هاوکلاس بووین و لە سەر کورسیەک دادەنیشتین›.

**همکلاسی** / hamkelāsî ، ـها/: [فارسی/ فرانسوی] *اسم.* هاوپۆلی؛ هاوکلاسی؛ هاودەرسی؛ هاوقوتابی.

**همکلام** / hamkalām/: [فارسی/ عربی] *صفت. [گفتاری]* هاوقسە؛ هاوتە؛ هەڤپەیڤ ‹من هیچوقت با او همکلام نبوده‌ام: هیچ‌کات دەگەڵی هاوقسە نەبووم›.

**همکیش** / hamkîš/: *اسم.* هاودین؛ هاوئایین؛ چەند کەسی شوێنگری ئایینێ.

**همگام**[1] / hamgām ، ـان/: *صفت.* هاوڕێ؛ هاوقۆڵ: ١. هاوهەنگاو؛ بە ڕێباز و خێرایی یەک‌چەشنەوە ٢. *[مجازی]* هاودەنگ؛ هاوئاهەنگ ٣. هاومەبەست؛ هاودۆز.

**همگام**[2]: *قید.* پێ‌بەپێی؛ هاوڕێ؛ هاوقۆڵ؛ هاوهەنگاو ‹همگام با کارگران شهرداری به پاکسازی خیابانها پرداختند: پێ بە پێی کرێکارانی شارەداری کەوتنە خاوێن کردنەوەی شەقامەکان›.

**همگامی** / hamgāmî ، ـها/: *اسم.* هاوقۆڵی؛ هاوهەنگاوی؛ هاوقامی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هاوڕێیی‌کردن دەگەڵ کەس یان کەسانی‌تردا.

**همگان** / hamegān/: *ضمیر.* گشت؛ گش؛ هەموو؛ هەمووان؛ تێکڕا؛ هەمین؛ هەمینە؛ هەمێ؛ گشت‌لە گشت؛ گشک؛ هەمیان ‹همگان از ماجرا آگاه شدند: گشت لە ڕووداوەکە ئاگەدار بوون›.

**همگانی** / hamegānî/: *صفت.* هەمووانی؛ گشتی؛ تێکڕایی ‹ورزش همگانی؛ گذرگاه همگانی: وەرزشی هەمووانی؛ ڕێبازی گشتی›.

**همگرا** / hamgerā ، ـها/: *صفت.* یەکگر؛ یەکانگیر؛ ڤێک‌کەت؛ وێک‌کەوت؛ هەڤگر: **همرَس**

**همگرایی** / hamgerāyî ، ـها/: *اسم.* یەکگری؛ یەکانگیری؛ ڤێک‌کەتی؛ وێک‌کەتی؛ هەڤگری؛ دۆخی لێک‌نزیک بوونەوەی پاژگەلی کۆمەڵێک.

**همگن** / hamgen/: *صفت.* ١. ـان/*[ادبی]* یەکجۆر؛ هاوچەشن؛ وەک‌یەک؛ وێکچوو؛ لێکچوو ٢. ـها/*[شیمی]* ☜ **همُوژن**

**همگون** / hamgûn ، ـها/: *صفت. [ادبی]* یەکجۆر؛ هاوجۆر؛ هاوگوێن؛ هاوجنس؛ هاوچەشن؛ لێکچوو؛ وێکچوو؛ وەک‌یەک.

**همگونی** / hamgûnî ، ـها/: *اسم. [ادبی]* یەکجۆری؛ هاوجۆری؛ هاوگوێنی؛ هاوجنسی؛ هاوچەشنی؛ لێکچوویی؛ وێکچوویی.

**همگی**[1] / hamegî/: *صفت. [گفتاری]* گش؛ گشت؛ هەموو؛ تێکڕا؛ تێکڕایی؛ کۆگرد؛ هەمان؛ گلا؛ گش‌لا؛ تەواوی؛ گرد؛ تەواو ‹همگی سیبها خراب

بودند: کش سیوەکان خراپ بوون›.

همگی [2]: قید. [گفتاری] هەموو؛ گشت؛ گشک؛ گرد؛ گش؛ بە گشتی؛ بە تەواوی؛ سەرانسەر؛ تێکڕا؛ بە تێکڕا؛ بە تێکڕایی ‹همگی رفتند پیش رییس: هەموو چوونە لای سەرۆک›.

همگیر / hamgîr ، ـها/: اسم. تێک‌پەستاو؛ شتێک کە لە چەسپاندنی ماکی وردیلە لە ژێر گوشاردا بەرهەم دێ (وەک تەختەی نیئۆپان).

همگیس / hamgîs ، ـها؛ ـان/: اسم. [گفتاری] هێوەرژن؛ هێوەرژەنی؛ هاوگیان؛ هەوگیان؛ هۆمبی؛ جاری؛ براژنی مێرد؛ هەرکام لە دوو یان چەند ژنی دوو یان چەند برا.

هم‌مرز / ham.marz ، ـها/: صفت. هاوکەوشەن؛ هاوسنوور؛ هەڤسینور؛ هاومەرز؛ هام‌مەرز ‹ایران در باختر با عراق و ترکیه هم‌مرز است: ئێران لە ڕۆژاواوە دەگەڵ عیراق و تورکیەدا هاو کەوشەنە›.

هم‌معنی / ham.ma'nî ، ـها/: [فارسی/ عربی] صفت. هاوواتا؛ هاومانا ‹همگیس و جاری هم‌معنی هستند: هێوەرژن و هاوگیان هاومانان›.

هم‌منقل / ham.manqal ، ـها/: [فارسی/ عربی] صفت. هاومەنگەڵ؛ هاوشیرەیی؛ بە یەک کەلپەلی تریاک‌کێشانەوە ‹او با عموی خدابیامرزم هم‌منقل بود: دەگەڵ مامی ڕەحمەتیم هاومەنگەڵ بوون›.

هم‌میهن [1] / ham.mîhan ، ـان/: اسم. هاونیشتمانی؛ هاونیشتمان؛ هاوزێد؛ هاوولاتی؛ هاوولایەتی؛ هام‌وەلاتی؛ هاووەتەن؛ هام‌وەتەن؛ ئەوانەی ولاتیان یەکێکە ‹به هم‌میهن خود کمک کنید: بە دەم هاونیشتمانی خۆتانەوە بن›.

هم‌میهن [2]: صفت. هاوزێد؛ هاوولاتی؛ خۆولاتی؛ هاولایەتی؛ هام‌وەلاتی؛ هام‌وەلایەتی؛ هام‌وەتەن؛ هاووەتەن؛ لە باری نیشتمانەوە هاوبەش ‹آنان هم‌میهن بودند: ئەوان پێکەوە هاوزێد بوون›.

همنام / hamnām ، ـها/: صفت. هاوناو؛ هەڤناف؛ خاوەن ناوی وەک یەک ‹دامادهای سارا خانم همنام هستند: زاواکانی خاتوو سارا هاوناون›.

همنژاد / hamnejād ، ـها/: صفت. هاوڕەگەز؛ هامڕەگەز؛ هەمگەل؛ هاونەژاد.

هم‌نشست / hamnešast ، ـها/: اسم. کۆ بوونەوە؛ سەمپوزیۆم.

همنشین / hamnešîn ، ـها/: اسم. هاونشین: ١. /ـها/ چەند کەس کە پێکەوە هات‌وچۆ و وت‌وویژی دۆستانەیان هەیە ٢. /ـان/ هاودەم؛ هاوڕاز؛ هاوقسە ٣. [دستور] ناو یان دەستەناوێ کە بۆ لێکدانەوەی ناوێک دەگەڵیدا دێن (وەک لە ڕستەی «هەژار هۆنەری مەزنی کورد لە مەهاباد لە دایک بوو»، «هەژار» ناوە و «هۆنەری مەزنی کورد» هاونشینە): **بَدَل: جانشین**

همنشینی / hamnešînî ، /: اسم. هاونشینی؛ هاودەمی؛ هاوقسەیی؛ هاوڕازی: ١. کار و ڕەوتی دانیشتن و وت‌وویژکردنی دۆستانە لەگەڵ کەسێکدا ٢. دۆخ یا چۆنیەتی هاودەم بوون.

همنفس / hamnafas /: [فارسی/ عربی] ☜ **همدَم ـ١**

همنوا / hamnavā /: صفت. [ادبی] هاوئاهەنگ؛ هاودەنگ: ١. بە یەک ئاهەنگەوە ٢. یەک‌دەنگ.

همنوائی / hamnavā'î / ☜ **همنوایی**

همنوایی / hamnavāyî /: اسم. هاوئاهەنگی؛ هاودەنگی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی هاوئاهەنگ بوون ٢. /ـها/ یەک‌دەنگی ٣. کۆمبێژی؛ کاری گۆرانی خوێندنی بە کۆڕ * **همنوائی**

همنوع / hamnow', hamno:' ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] اسم. هاوگوێن؛ هاوجۆر؛ هاوچەشن؛ هەرکام لەوانەی لە تیرەیەکدا دەژین، بەتایبەت بۆ مرۆڤ.

همنهشت / hamnehešt /: صفت. هاودەق؛ هەمبەر.

همنهشتی / hamneheštî /: اسم. [هندسه] هاودەقی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هەمبەر بوونی دوو بیچم لە سەر یەک.

**همو** / hamû/: ضمیر. [ادبی] هەر ئەو؛ خوەی؛ خۆی؛ ویش؛ هەر خوی؛ ئەوە خۆی؛ هەر وی؛ هەر ئا کەسە؛ هەر ئەو کەسە ‹همو بود کە در آن سال‌ها مبارزەی بی‌امان داشت: هەر ئەو بوو لەو سالانەدا بەبێ وچان خەباتی دەکرد›.

**هموار** / hamvār/: صفت. ساف؛ لووس؛ بێ گرێ: ١. تەخت؛ تات؛ گۆڕ؛ هامار؛ ڕێک؛ لێک؛ هۆمار؛ دەق؛ هومار؛ بێیاز؛ یەکادەس؛ بێ‌بەرز و نزمی و کەند و کلۆ ٢. نەرم؛ بێ زبری و ڕەقی.

▣ **هموار کردن**: تەخت‌کردن؛ هێنانە بار؛ ڕێک کردن؛ ساف‌کردن؛ ڕێک/ تەخت‌کەردەی.

**بر خود هموار کردن**: [مجازی] هەڵگرتن؛ سەپاندنە مل خۆ؛ بە سەر خۆدا سەپاندن؛ کردنە مل خۆ.

**همواره** / hamvāre/: قید. هەمیشە؛ هە؛ هەر؛ دایمە؛ دایم و دەرهەم؛ هەموو دەم؛ هەموو کات؛ هەموو دەمێ؛ هەموو کاتێ ‹همواره به یاری دیگران می‌شتافت: هەمیشە بە دەم خەڵکەوە بوو›.

**همواری** / hamvārî/: اسم. تاتی؛ تەختی؛ ڕاسایی؛ تەختایی؛ تەختانی؛ گۆڕایی.

**هم‌وزن**[1] / hamvazn، ـها/: [فارسی/ عربی] صفت. هاوکێش؛ هەڤکش؛ هاوسەنگ؛ هامسەنگ؛ هاوتا؛ هاووەزن؛ هامەوزن؛ هنکوف؛ لە کێشاندا بەرانبەر ‹وزنەی هموزن: سەنگی هاوکێش›.

**هم‌وزن**[2]: قید. هاوکێش؛ هاوسەنگ؛ هامسەنگ؛ هاووەزن؛ هنکوف؛ هەڤکێش؛ بە قورسایی؛ بە قەد قورسی ‹هموزن پارچە طلا گرفت: هاوکێشی پارچەکە زێڕی وەرگرت›.

**همۆژن**/ homojen, hemojen/: [فرانسوی] صفت. [شیمی] یەکدەست؛ بە تایبەتمەندی یەکجۆر بوون لە باری تێکەڵاوی و خەستی و تەڕیەوە: **همگن ـ٢**

**همـۆژنیزه** / hemojenîze/: [فرانسوی] صفت. یەکدەست‌کراو.

**هموطن**[1] / hamvatan، ـها؛ ـان/: [فارسی/ عربی] اسم. هاونیشتمان؛ هاوزێد؛ هاوزێ؛ هاوولات؛ هەرکام لەو کەسانەی لە باری وڵاتەوە هاوبەشن.

**هموطن**[2]: صفت. هاونیشتمان؛ هاوزێد؛ هاوزێ؛ هاوولات؛ هەمباژاڕ؛ هەمباژێڕ؛ هامەوەڵات؛ بە نیشتمانی هاوبەش لەگەڵ کەس یان کەسانی‌تردا.

**هم و غم** / hamm-o-qam/: [عربی] اسم. [ادبی] کردوکۆش؛ کردوکاش؛ پەلوپۆ؛ هەوڵ و تێکۆشان؛ هەوڵ و تەقالا ‹همەی هم و غم او رفتن بە آمریکاست: هەموو کردوکۆشی ڕویشتن بۆ ئەمریکایە›.

**همـوفیلی** / hemofîlî/: [فرانسوی] اسم. خوێن‌نەگرسی؛ هیمۆفیلی؛ جۆرێک نەخۆشی خوێنی کە ئەگەر نەخۆش بریندار بوو خوێنی ناگرسێتەوە.

**هموگلوبین** / hemog(e)lobîn/: [فرانسوی] اسم. [زیست‌شناسی] هیموگلۆبین؛ ماکی ئاسنداری گلوبوولی سووری خوێن کە ئۆکسیژن بە لەشدا بلاو دەکاتەوە.

**همـولیز** / hemolîz/: [فرانسوی] اسم. [پزشکی] ڕەوتی شی بوونەوەی گلوبوولە سوورەکانی خوێن و بەر بوونی هیمۆگلۆبین بە هۆی نەخۆشی یان خوێنی ناتەبا کردنە ناو لەشەوە.

**هموند** / hamvand، ـها/: اسم. [ادبی] ئەندام؛ پاژێکی تا ڕادەیەک سەربەخۆی لەش (وەک سەر، دەست، پێ).

**همه**[1] / hame/: صفت. هەموو؛ حەموو؛ هەمێ؛ حەمێ؛ هەمە؛ هەمن؛ گشت؛ گش؛ گشک؛ گژ؛ گرد؛ گێ؛ یەک‌بەیەک؛ تاک‌بەتاک؛ تەک‌بەتەک؛ تەمام؛ خڕ؛ سەرپاک؛ لەبن؛ تێکڕا؛ سەرلەبەر؛ سەرانسەر؛ حەپو؛ تەواو؛ تەڤ ‹همەی شهرها: هەمەی مردم: هەموو شارێک؛ گشت خەڵک›.

**همه**[2]: قید. [گفتاری] تێکڕا؛ بە تێکڕایی؛ بە گشتی؛ گش؛ گشت؛ هەموو؛ هەمووان؛ گرد؛ بە تەواوی؛

به هەمووان؛ بە هەمووانەوە؛ بەیەکەوە ‹ما همه منتظر شما هستیم: ئێمە تێکڕا چاوەڕوانی ئێوەین›.

همه ¹: ضمیر. هەموو؛ هەمی؛ گشت؛ گش؛ گرد؛ هەمن؛ گز؛ حەپو ‹همه رفتند: همه را بردیم توی انبار: هەموو ڕۆیشتن؛ هەموومان بردە نێو هەمارەوە›.

همه ـ ²: پیشوازه. گـ ـ؛ گش ـ؛ گشت ـ؛ گرد ـ؛ هەموو ـ؛ هەمە ـ؛ هەرچی ـ؛ هەر ـ؛ سەرجەم ‹همەساله؛ همەوقت: گش‌سالێ؛ هەمووکات›.

همه‌اش / hame'aš/: قید. [گفتاری] هەر: ۱. لە پەستا؛ دایمە؛ پەساپەس؛ بە شێوەی بەردەوام و شوێنگر ‹همەاش می‌خورد: هەر دەیخوارد› ۲. ئەم هەمووە؛ ئەم گشتە؛ ئی گردە؛ ئەوەندە فرە ‹همەاش درس می‌خوانی که چه؟: هەر دەخوێنی کە چی بێ؟›.

همه‌پرسی / hameporsî ، ـها/: اسم. ڕاپرسی؛ ریفراندۆم؛ کۆمەڵپرسی؛ کۆپرسان؛ لێ‌پرسینەوەی گشتی، بۆ سەلماندن یا لابردنی قانوونێک.

همه‌جاگیر / hamecāgîr/: صفت. پەرەسێن؛ هەموولاداگر؛ داگری هەموو شوێنێ ‹بیماری همەجاگیر: نەخۆشی پەرەسێن›.

همه‌جانبه / hamecānebe/: [فارسی/ عربی] صفت. هەمەلایەنە ‹تلاش همەجانبه؛ حملەی همەجانبه: هەوڵی هەمەلایەنە؛ هێرشی هەمەلایەنە›.

همه‌چیزتمام / hamečîztamām/: [فارسی/ عربی] صفت. بێ‌کەم و کووڕ؛ بێ‌کەم و کووڕی؛ بێ‌کەمایەسی؛ تەواو.

همه‌چیزخوار / hamečîzxār ، ـها؛ ـان/: صفت. هەمووشت‌خۆر؛ بە تایبەتمەندی یان توانایی خواردنی هەموو شتێک (وەک گیا، گۆشت و...).

همه‌خدایی / hamexodayî/ ☜ **وحدت‌وجود**

همه‌روزه ¹ / hamerûze/: صفت. گرۆژە؛ گش ڕۆژە؛ گرۆ؛ هەرچی ڕۆژە؛ هەر ڕۆژە؛ گرۆیە؛ هەموو ڕۆژە؛ هەر ڕۆژە؛ ڕۆژانە؛ گرد ڕۆ؛ هەرچی ڕۆژە ‹برنامەی همەروزەی آنها همین بود: بەرنامەی گرۆژیان هەر ئەمە بوو›.

همه‌روزه ²: قید. هەموو ڕۆژێ؛ گش ڕۆژێ؛ گشت ڕۆژێ؛ گرۆژێک؛ هەموو ڕۆژێک؛ هەرچی ڕۆژە؛ هەرچی ڕوێ؛ لە هەرچی ڕۆژدا ‹همەروزه همین کار را می‌کنند: هەموو ڕۆژێ ئەم کارە دەکەن›

همه‌ساله / hamesāle/ ☜ **هرساله ²**

همه‌سویه / hamesûye/: صفت. هەمەلایەنە؛ گش‌لایەنە.

همه‌فن‌حریف / hamefanharîf ، ـها/: [فارسی/ عربی] صفت. هەزارپیشە؛ بە توانایی جێبەجێ کردنی هەموو کارێک ۲. فێڵباز؛ ساختەچی.

همه‌کاره / hamekāre ، ـها/: صفت. [مجازی] هەمەکارە؛ هەمووکارە؛ هەرچی‌کارە: ۱. دەسچووگ؛ دەس‌ڕۆیگ ‹او در آن اداره همەکاره است: لەو مەزرینگەیەدا خۆی هەمەکارەیە› ۲. هۆکارەی هەموو کارێ ‹همەکاره هیچکاره است: هەرچی‌کارە هیچ‌کارەیە› ۳. لەبار بۆ کاری زۆر ‹پیچ‌گوشتی همەکاره: پێچ‌گوشتی هەمەکارە›.

همه‌گیر / hamegîr/: صفت. [پزشکی] گیرۆ؛ ئامۆ؛ ئاهۆ؛ شەوب؛ ئێپیدیمیک.

همه‌گیری / hamegîrî/: اسم. [پزشکی] گیرۆیی؛ ئاهۆیی؛ پەتایی؛ درمی؛ ئێپیدیمی.

همه‌گیری‌شناسی / hamegîrîšenāsî/: اسم. [پزشکی] گیرۆناسی؛ درمناسی؛ پەتاناسی؛ ئاهۆناسی؛ ئێپیدیمولۆژی.

همهمه / hamhame ، ـها/: [عربی] اسم. هەرا و هوریا؛ هەرا و هووریا؛ هەرا ـ هەرا؛ کێشە و هەرا؛ هێڵ‌هێڵەک؛ چەقە؛ گورە و زەنا؛ زەنا ـ زەنا؛ چەقە و گورە؛ گانەگۆڵ؛ قاووقریشک؛ قاوقوو؛ قاوقیژە؛ دەنگەدەنگ؛ قالمەقاڵ؛ هەلا؛ زلە؛ دورزو؛ قیڕوقاڕ؛ کوتوکەش؛ خولخولە؛ هەرا و چەقە؛ خولۆ؛ خوڵوو؛ هۆڕپەهۆرپ؛ گەپگوڕ؛ چەقەچەق؛ گۆمەڵ؛ گۆڵمەز؛ گێلەشۆ؛ گێلەشۆک؛ قوولەقوول؛ گۆنگەڕ؛ هومەڵفەزا؛ ڕۆمەڵغەزا؛ کەپۆرە؛ گرموقاڵ؛ قیژە و هەرا؛

حەشـە و قـۆ: ١. دەنگـی نادیـاری وتـوویـژی چـەن کـەس ‹ناگهـان همهمـه شـد و دیگـر صـدای سخنران شنیده نمی‌شد: له ناکاو بووه هـەرا و هوریـا و چیتر دەنگی وتاربێژەکـە نەدەبیسـترا› ٢. دەنگـی زۆری لـە دوور ‹همهمـەی کوچـه بیـدارم کـرد: قالمەقالی ناو کۆڵان خەبەرمی کردەوە›.

**همیـــاری** / hamyārî/: اسـم. ١. هاوقۆڵـــی؛ ئاریکـاری؛ هاریکـاری؛ هەڤـبەندی؛ هەڤـکاری؛ یاریـدەری؛ یارمـەتی و هاوکـاری چەنـد کـەس پێکەوە ٢. هەرەوەز؛ زبارە؛ کاری بە کۆمـەڵ بـۆ گەیشتن بە ئامانجێکی بەرچاو.

**همیان** / hamyān/ ☜ **آنبان**

**همیانه** / hamyāne/ ☜ **آنبان**

**همیشـــک** / hamîšak ، ـهـا/: اسم. قنگاوڵـە؛ قنگاوڵـێ؛ دووپەڵـە؛ دووپـەڕە؛ پنچکەگیایـەکی دایمەشین بە گەڵای دڕکـاوی و گوڵـی جـوانی نارنجی و بۆنخۆشەوە کـە بـۆ جـوانی چەپکـەی دەکەن.

**همیشـــگی** / hamîšegî/: صـفت. هەمیشـەیی؛ بێبڕانەوە؛ بێ‌پسانەوە؛ تممی؛ هەتاهـەتایی ‹کـار همیشگی: کاری هەمیشەیی›.

**همیشـــه** / hamîše/: قیـد. هەمیشـە؛ هەمەتـە؛ دەمبەدەم؛ تاسەر؛ هەتاسەر؛ تەوتم؛ هەمووکاتێ؛ هەموو دەمێ: ١. لە هەر کاتێکدا ‹همیشه می‌شد او را پیدا کرد: هەمیشە شوێنی هەڵدەکرا› ٢. هـەر؛ هەتا_هەتایە ‹همیشه به یادم می‌ماند: هەر لـە بـیرم دەمێنێ›.

**همیشـــەبهـــار** / hamîšebahār ، ـهـا/: اسـم. هەمیشەبەهار؛ هەمیشـەبەهارە؛ هەمیشـەوەهار؛ هەمیشەجوان؛ بەیبوونە کێویلە؛ گیایەکی جوانی یەکساڵەیە بە گەڵای کولکن، دوو جـۆر گوڵـی زمانەیی و لوولەیی زەرد و بەری وەک فندقـەوە کە لە چواروەرزی ساڵدا گوڵ دەکا: **آذرگون ـ٣؛ آذریون**

**همیشـــەسبز** / hamîšesabz ، ـهـا/: صـفت. [گیاەشناسی] هەمیشە سەوز؛ هەمیشە سەرسـەوز؛ دایمەشین (وەک داری کاج): **پیوستەسبز**

**همین** / hamîn/: صفت. ئەم؛ هەر ئەم؛ هەر ئی: ١. ئامازە پێکراو یـان گـوتراو ‹از همین کـار نـان مـی‌خـورد: لـە ئـەم کـارەوە نـان دەخـوا› ٢. بـە مەودایەکی کەمتر ‹همین بغل دست ماست: ئـەم لا دەستەمانە›.

**همین**[٢] / ـها/: ضمیر. ئائەمـە؛ ئەئەمـە؛ هەرئەمـە؛ ئامە؛ هەر ئینە؛ ئەیە؛ ئەمە؛ هەو؛ هـەرەو ‹همین بود که خورد به سرم: ئائەمە بوو دای لە سەرم›.

**همینطـــور** / hamîntowr/: [فارسـی/ عربـی] قیـد. هـــەروا؛ هـــەروە؛ هـــەرئاوا؛ هـــەرهۆ؛ هـــەرئاوها؛ هەروسا؛ ئابەم جۆرە ‹داشتم همینطور می‌رفتم: هەرو خەریک بووم دەڕۆیشتم›.

**همـین کـه** / hamînke/: قیـد. هەرکـە؛ هـەرکر؛ هەرکوو؛ تا؛ تاکوو ‹همین که خواست بلند شود، سرش گیج رفت: هەرکە ویستی هەستێ، سەری لە گێژەوە چوو›.

**همیوغ** / hamyûq/: [فارسی/ ترکی] اسم. هاونێڵە؛ هاونیلە؛ هاوگا؛ هاونێر؛ هاونیر؛ هاوتا؛ دووگـا لـە پەنا یەکتر کە پێکەوە جووتیان پێ دەکەن.

**هن** / hen(n)/: صوت. خن؛ شن؛ شنە؛ خنە؛ هانە؛ هانکە؛ هەنکـە؛ حەنکەحـەنک؛ هەسکەهەسـک؛ هانکەهانک؛ دەنگـی هەناسـەدانی لەسـەریەکی ماندوو.

**هنجار** / hancār ، ـها/: اسم. ١. هەنجار؛ پێودان؛ شێوە، ڕەوت یان پێوەرێکی باوەڕپێکراو ٢. پـۆڕ؛ نـەریتێکی گونجـاو بـۆ کـاری دروسـت کـە ئەنـدامانی دەسـتەیەک پێکـەوە گـرێ دەدا و ئاکاری دروست و گونجاو بەرێوە دەبا.

**هنـــدبال** / handbāl/: [انگلیسـی] اسـم. [ورزش] هەندباڵ؛ یاریەکی وەک فووتباڵ کە بـە دەسـت تۆپەکە دەهاوێن.

**هندسه** / hendese, handase/: [معرب از پهلوی] اسم. هەندەسە: ١. لقێ لە زانستی بیرکاری کـە

به ئەندازەگیری، تایبەتمەندی و پێوەندیەکانی خاڵ، هێڵ، ڕووبەر، گۆشە و بارستاییەوە دەپەرژێ ۲. کتێبێک لەمەڕ هەندەسەوە.

▣ هندسەی اقلیدسی: هەندەسەی ئوقلیدوسی؛ هەندەسەیێ کە بە گوێرەی بنەمای هاوڕێکی (تەوازی) ڕێکخراوە.

هندسەی تحلیلی: هەندەسەی شیکارانە/ لێکدانەوەیی؛ لێکۆڵینەوەی دانستەی هەندەسی بە کرداری جەبری.

هندسەی تصویری: هەندەسەی وێنەیی/ شێوەیی.

هندسەی فضایی: هەندەسەی سێلایی/ فەزایی/ بۆشایی؛ بەشێک لە هەندەسە کە بە لێکۆڵینەوەی تەشکگەلی فەزاییەوە دەپەرژێ.

هندسەی مسطحه: هەندەسەی دوولایی/ دووبەری؛ بەشێک لە هەندەسە کە بە لێکۆڵینەوەی تەشکی سەر پەڕەوە دەپەرژێ.

هندسەی نااقلیدسی: هەندەسەی نائوقلیدوسی؛ هەر یەک لەو هەندەسانەی کە بنەمای هاوڕێکی (تەوازی) تێدا وەرنەگیراوە.

هندسی / hendesî, handasî/: [معرب] *صفت*. هەندەسی: ۱. سەر بە هەندەسە ۲. بە بیچمێکی ڕێکوپێک.

هندل / hendel, handel ، ـها/: [انگلیسی] *اسم*. *[قدیمی]* هیندل؛ ئامرازێ بۆ هەڵکردنی ماشین.

▣ هندل زدن: هیندل لێدان؛ هەڵسووڕاندنی هیندل بۆ هەڵکردنی ماشین.

هندو / hendû/: *اسم*. هیندوو: ۱. دینێکی خەڵکی هیند ۲. *ـها*؛ هندوان hendovān/ هەرکام لە شۆنەڕاکانی دینی هیندوو ۳. *[قدیمی]* هیندی ناموسڵمان.

هندوانه / hendevāne ، ـها/: *اسم*. شووتی؛ شۆتی؛ شتی؛ شبتی؛ شمتی؛ شمستی؛ شفتی؛ شمتوو؛ شمتن؛ شیتوو؛ شووتوو؛ شامی؛ شوومی؛ سمتوو؛ سمتن؛ سمتی؛ هەنی؛ هەننی؛ هەندی؛ هەنگی؛ هەینی؛ هندی؛ هیندوویی؛ جەبەش؛ زەبەش؛ زەربەش؛ جەبەژ؛ ژەبەش؛ زەبەز؛ ژەبەژ: ۱. شەتڵە گیایێ لە تیرەی خەیار، بە گەڵای شەقار- شەقار، لاسکی خەوتوو، گوڵی زەرد و میوەی ئاوداری خۆراکیەوە ۲. میوەی خڕی ئەو گیایە بە توێکڵێکی ئەستووری سەوز، گۆشتی سوور یان زەردی شیرین و ئاودارەوە کە دەنکەکانی تێیدا بلاون.

▣ هندوانەی ابوجهل: کالەکەمارانە؛ شوویتەمارانە؛ گوژاڵک؛ کوژاڵک؛ هەنزەل؛ زەرەنگ؛ زەرەند؛ گووژەڵ؛ گوهێ شەیتانک؛ تەحلەسێف؛ تەحلەسێف؛ خەیاردێمی؛ ژوژالک؛ زرکەتاڵ؛ شفتیتالک؛ شفتیتاڵە؛ شمتیتالک؛ شوومی شەیتونی؛ گونەسر؛ گوێبەلە؛ گیایەکی وەک شووتی کە تاڵ و ژاراویە: **حنظل**

▣ هندوانه زیر بغل کسی دادن: *[کنایی]* با کردنە قول کەسێ؛ کەسێک لە خشتە بردن؛ شووتی دانە بنهەنگڵی کەسێک؛ بە پێدا هەڵگوتنی بێجێ، کەسێک لەخۆبایی کردن ‹هندوانه زیر بغلم دادند و او را فرستاند جلو: بابان کردە قولی و ناردیانە بەرەوە›.

با یک دست دو هندوانه برداشتن ☜ **یک**[2]

هندو- اروپایی / hendo-urûpāyî, -orûpāyî/: [فارسی/ فرانسوی] *اسم*. هێندو- ئۆرووپایی؛ کۆمەڵە زمانێک بە چەن لقی زمانیەوە کە زۆربەی خەڵکی ئورووپا، ئەمریکا، ئوسترالیا و بەشێکی زۆر لە ڕۆژهەلاتی ناوین قسەی پێدەکەن.

هندو- ایرانی / hendo-îrānî/: *اسم*. هێندو- ئێرانی؛ لقێکی گەورە لە زمانگەلی هێندو-ئورووپایی کە بۆ خۆی دوو لقی هیندی و ئێرانی لێ دەبێتەوە.

هندوستانی / hendûstānî/: *اسم*. هێندووستانی؛ لە زمانەکانی باوی هیند کە تێکەلاویکە لە

هیندی و ئوردوو.

**هندی**[1] / hendî /: *اسم.* هیندی: ۱. زمانی ویژەیی و ڕەسمی هیند، لە زمانەکانی هیندو-ئیرانی ۲. /ها؛ ـان/ هەرکام لە خەڵکی ناوخۆیی هیند یان مندالانیان ۳. *[نجوم]* وێنەیەکی ئاسمانی باشووری کە لە خوار پای تیرهاویژدایە.

**هندی**[2]: *صفت.* هیندی؛ سەر بە وڵاتی هیند.

**هنر** / honar ، ـها/: *اسم.* هونەر؛ جەوهەر: ۱. کاری شاندان و دەربڕینی وەستایانەی هزر و بۆچوون لە دیاردە و ڕووداوەکانی جەهانی دەرەوە ۲. وەستایی و لێهاتوویی لە پیشاندانی ئەو بۆچوونانە ۳. دەسڕەنگینی؛ جوانکاری؛ بەکار هێنانی هەستیارانە و داهێنەرانەی خەیاڵ، بۆ بەرهەم هێنانی بەرهەمی جوان و ڕازاوە ٤. هونەرە جوانەکان (وەک: مووسیقا، نیگارڤانی، پەیکەرتراشی، شیعر و...) ٥. لێزانی و کارامەیی بە هۆی ئەزموون، دیتن یان خوێندنەوە ‹هنر فروشندگی: هونەری فرۆشیاری› ٦. *[مجازی]* کاری گرینگ و بەرچاو.

▣ هنر تجسمی: هونەری هزری؛ هەرکام لەو هونەرانەی وا کاریان بەدیهێنانی شتی بەرچاو و جێی تێڕامانە (وەک: نیگارڤانی، میعماری، پەیکەرتراشی و...).

هنر نمایشی: هونەری شانۆیی؛ هەرکام لەو هونەرانە وا دەپەرژێنە سەر نیشاندان (وەک شانۆک، فیلم، ئۆپێرا و ...).

هنرهای زیبا: هونەرە جوانەکان: ۱. ئەو هونەرانەی پێویستیان بە وردەکاری و جوانکاریە ۲. ئەو هونەرانەی سەر بە داهێنانی بەرهەمی جوان و ڕازاوەن (وەک مووسیقا، نیگارکێشی، پەیکەرسازی).

▣ هنر کردن: *[مجازی]* هونەرکردن؛ کارامەیی زۆر نیشاندان.

**هنرآموز** / honarāmûz ، ـها؛ ـان/: *اسم.* ۱. فێرکاری هونەر ‹هنرآموز خیاطی: فێرکاری هونەری دروومان› ۲. قوتابی هونەریستان.

هنرپرور / honarparvar ، ـان/: *صفت.* هونەرپەروەر؛ بارهێنەر یان حاوێنەری هونەر و هونەرمەند ‹سرزمین هنرپرور: وڵاتی هونەرپەروەر›.

هنرپیشگی / honarpîšegî /: *اسم.* شانۆیاری؛ شانۆگەری؛ نیاری؛ هونەربازی؛ هونەرپیشەیی؛ کار و ئیشی نیارڤان.

هنرپیشه / honarpîše ، ـها؛ ـگان/: *اسم.* شانۆیار؛ هونەرباز؛ نیار؛ نیارڤان؛ کۆسەکار؛ شانوگەر؛ ئەو کەسەی لە شانۆدا کایە دەکا ‹هنرپیشەی سینما: شانۆکەری سینەما›.

هنرجو / honarcû ، ـها؛ ـیان/: *اسم.* هونەرواز؛ خوێندکاری زانکۆی هونەر.

هنردوست / honardûst ، ـها؛ ـان/: *صفت.* هونەردۆست. هەروەها: **هنردوستی**

هنرستان / honarestān ، ـها/: *اسم.* هونەرستان؛ هونەرگە؛ فێرگەی هونەر؛ قوتابخانەی دواناوەندی کە دەرسی هونەر یان فێرکاری تێدا دەڵێنەوە.

▣ هنرستان عالی: هونەرستانی باڵا؛ زانکۆ یان قوتابخانەی باڵا کە یەکێک لە ڕشتەگەلی هونەری یان فێرکاری تێدا دەڵێنەوە.

هنرستانی / honarestānî /: *صفت.* هونەرستانی؛ سەر بە هونەرستان ‹دانش‌آموز هنرستانی: قوتابی هونەرستانی›.

هنرسرا / honarsarā ، ـها/: *اسم.* ۱. یانەی هونەر؛ دامەزراوەی فێرکاری بۆ ڕاهێنانی مامۆستایانی هونەر ۲. هونەرستان.

▣ هنرسرای عالی: دامەزراوەی فێرکاری باڵا؛ قوتابخانەی درێژەپێدانی ڕشتەگەلی هونەری یان فێرکاری.

هنرکده / honarkade ، ـها/: *اسم.* یانەی هونەر؛ دامەزراوەی باڵای فێرکاری هونەر ‹هنرکدەی نقاشی: یانەی هونەری نیگارکێشی›.

**هنرمند**[1] / honarmand ، ـها؛ ـان/:اسم. هۆنەر؛ هونەرمەند؛ هونەری؛ هونەروەر؛ هونەرمەن؛ کەسێ کە بەرهەمی هونەری بەدی دێنێ ‹یک هنرمند کرد موفق به دریافت جایزەی بین‌المللی ونیز شد: هونەرمەندێکی کورد خەلاتی نێونەتەوەیی وینیزی وەرگرت›.

**هنرمند**[2]: صفت. هونەرمەند؛ هونەری؛ بە جەوهەر و هونەر؛ جوانکار؛ دەس‌ڕەنگین؛ بە هونەر؛ مایەوەر؛ هونەروەر؛ وردەکار؛ شیرین‌کار؛ هونەرمەن؛ کارجوان؛ لێهاتوو بۆ بەدیهێنانی بەرهەمی هونەری ‹مستورەی اردلان زنی هنرمند و هنردوست بود: مەستوورەی ئەردەلان ژنێکی هونەرمەند و هونەردۆست بوو›.

**هنرمندانه** / honarmandāne/: قید. هونەری؛ هونەرمەندانە.

**هنرمندی** / honarmandî/: اسم. هۆنەری؛ هونەرمەندی؛ هونەروەری؛ دەس‌ڕەنگینی؛ دۆخ یان چۆنیەتی هونەرمەند بوون.

**هنرنمایی** / honarnemāyî ، ـها/: اسم. هونەرنوێنی؛ کار یان ڕەوتی ڕانانی بەرهەم و چالاکیە هونەریەکان.

**هنرور** / honarvar ، ـان/: صفت. [ادبی] هۆنەر؛ هونەرمەن؛ هونەروەر؛ کارزان.

**هنری** / honarî/: صفت. هونەری؛ سەر بە هونەر ‹اثر هنری: بەرهەمی هونەری›.

**هنگ** / hang ، ـها/: اسم. ۱. [نظامی] تابوور؛ فەوج؛ هەنگ؛ هێز؛ دەستەی هەزارکەسی لەشکەر ۲. [قدیمی] سپا؛ لەشکر ۳. [قدیمی] ئاوەز؛ ئاوز؛ ژیری ٤. زۆر؛ هێز؛ شەنگ؛ هازی.

**هنگام** / hengām/: اسم. کات؛ وادە؛ وایە؛ وەعدە؛ عان؛ وەخت؛ سات؛ هەنگاف؛ کێلی؛ گاف؛ قاس؛ جەنگە؛ قات؛ حەل؛ نیر؛ حان؛ وا؛ زەمانی پێوەندیدار یان لەبار بۆ کار یان ڕووداوێک ‹هنگام شب؛ هنگام بهار: کاتی شەو؛ کاتی بەهار›.

**هنگامه** / hengāme/: اسم. ئەنگامە؛ هەنگامە: ۱. هەرا و هووریا؛ زەنا ـ زەنا؛ گۆتاوەڕۆ؛ گۆنگەشە؛ گۆنگەر؛ گوردەم؛ زلە؛ چرەبەندان؛ گوڕمۆڕە؛ گرم و هۆڕ؛ چەقە و گوڕە؛ تێکەوە هاوێش؛ هەللا؛ هەراهور؛ هەقلیمەقۆ؛ دۆخی بریتی لە ئاپۆرەدان و هەرا ـ هەرای خەڵکی لە شوێنێکدا ‹امروز در خیابانها هنگامه‌ای بود، بیا و ببین!: ئەمرۆ لە نێو شەقامدا هەرا و هووریایەک بوو، مەپرسە!› ۲. ئاژاوە؛ ئاشۆ؛ گاشە؛ پشێوی؛ گۆبەند؛ گۆتاوەڕۆ؛ گۆتال ۳. [قدیمی] گۆبەند؛ گۆڤەن؛ کۆڕ و بەزمێ لە گەڕەکدا کە حیکایەتی تێدا دەخوێننەوە یان کارگەلی شانۆیی لێ‌دەگێڕن ٤. هەڕەت؛ کات؛ جەنگە؛ گۆبەن ٥. [گفتاری] کاری گەورە و سەیر و سەمەرە.

**هنگامه‌جو** / hengāmecû ، ـها؛ ـیان/: صفت. [ادبی] گۆبەندگێڕ؛ ئاژاوەچی؛ لە دووی شەڕ هەڵخراندن و ئاژاوە نانەوە.

**هنگامی** / hengāmî/: قید. [ادبی] کاتێ؛ کاتێک؛ لەوکاتەدا؛ لەدەمێکا؛ دەمێکی؛ گاڤا؛ گاڤەک؛ هەلێ؛ یەو دەمە؛ وەختایەک؛ وەختارێک؛ وەختارێ؛ وەختارێو؛ وەختاریە؛ ئەو دەم؛ سەردەمێک؛ عانیە؛ عانێ ‹کار هنگامی تمام شد کە هوا تاریک شدە بود: کارەکە کاتێ دوایی هات کە شەو داهاتبوو›.

**هنگفت** / hangoft,hengoft/: صفت. بۆش؛ زۆر و زەبەند؛ زەبەند؛ فرەفرە؛ یەکجار زۆر ‹خرج هنگفت؛ پول هنگفت: خەرجی بوش؛ پارەی زۆر و زەبەند›.

**هنوز** / hanûz/: قید. هێشتا؛ هیشتەی؛ هێشتای؛ هێشتانەکی؛ هێشتاکە؛ هێشتاکانی؛ هێشتاکوو؛ هێشتاکۆنی؛ هێشتاکینی؛ هێشتاکانێ؛ هێشتان؛ هێش؛ هێشا؛ ئێستا؛ تائێستەش؛ تا ئێستەیشە؛ ئائیسەیچە؛ تا ئیسەکەتی؛ تا ئێستێ؛ وێستا؛ ویستا؛ تا ئێستە؛ تا ئێستایش؛ تا ئێستاش؛ یەمە؛ هەتانۆکە؛ هەما؛ هەی‌ما؛ هێما؛ هێمان؛ هما؛ هلا؛ هەلای؛ هێرا؛ هەمین؛ هێ؛ هامرای؛ جارێ؛

جارێکـان؛ جـارێو؛ جاریـه؛ هۆنـا؛ ئیسـه‌یچه؛ تـا ئیسه‌تێ؛ هه‌نووکه: ١. تا ئه‌م یا ئه‌و کـات ‹هنوز نرسیده بود: هێشتا نه‌گه‌یشتبوو› ٢. له‌م کاته‌دا و تا ماوه‌یه‌کی دوایی ‹هنوز نمی‌خورم: هێشتا ناخۆم› ٣. هـه‌ر؛ هـه‌روه‌ها؛ ئاوه‌هـا ‹هنوز خانه‌مان همانجاست: هێشتا مالمان له‌وێدایه› ٤. ده‌گه‌ڵ ئه‌م هه‌موو؛ له‌ته‌ک ئه‌م هه‌مکه ‹هنوز سیر نشده‌ام: هێشتا تێر نه‌بووم›.

◙ هنوز که هنوز است: [گفتاری] ئێسته و ئێسته‌ش؛ ئیسه و ئیسه‌یشه؛ ئیسه و ئیسه‌یچ.

**هن و هن** / henn-o-hen /: صوت. هانکه‌هانک؛ نکه‌نک؛ هه‌نکه‌هه‌نک؛ فشافش؛ خنه‌خن؛ مشه‌مش؛ هه‌ناک ــ هه‌ناک؛ هه‌سکه‌هه‌سک؛ هه‌لکه‌هه‌لک؛ هانه ــ هانه؛ شنه‌شن؛ ده‌نگی پشووسواری له به‌ر کاری زۆر و ماندوویه‌تی.

◙ به هن و هن افتادن: که‌وتنه هه‌سکه‌هه‌سک؛ هه‌لاکان؛ که‌وتنه هانکه‌هانک؛ هه‌نکیان؛ هه‌ناکیه‌ی؛ نه‌فه‌س بڕان؛ که‌وتنه هه‌ناسه‌بڕکێ؛ ته‌نگه‌نه‌فه‌س بوون ‹چهار تا پله را که بالا می‌رفتم به هن و هن می‌افتادم: چوارپلیکان ده‌چووم سه‌ر ده‌که‌وتمه هه‌سکه‌هه‌سک›.

هن و هن کردن: هانه‌هان‌کردن؛ هانکه‌هانک کردن؛ هه‌نکیان؛ نرکاندن؛ هه‌سکه‌هه‌سک کردن.

**هو** / how, ho: /: اسم. ١. [گفتاری] قـوو؛ ده‌نگۆ ٢. [کُردی] هۆ؛ هه‌و؛ هه‌وکێم؛ کێم؛ کێخ؛ چڵک؛ ئاودز؛ ئاوجز.

◙ هو افتادن: [گفتاری] قوو داکه‌وتن؛ قوو به‌رزه‌و بوون؛ قووکه‌وته‌یره؛ ده‌نگۆ بلاوه‌وه بوون؛ قسه بلاو بوونه‌وه؛ قسه که‌وتنه سه‌ر زمان ‹هو افتاده بود که قرار است وام مسکن بدهند: قسه داکه‌وتبوو بڕیاره وامی خانوو بده‌ن›.

هو انداختن: [گفتاری] قـوو داخستن؛ قـوو کردن؛ ده‌نگۆ بلاوکردنه‌وه ‹معلوم شد دلال‌ها هو انداخته‌اند: ده‌رکه‌وت ده‌لاله‌کان قوویان داخستبوو›.

**هـو**: صوت. ١. عیو؛ عۆ؛ هوو؛ ده‌نگێک به نیشانه‌ی تیز و گاڵته یان نارِه‌زایه‌تی ده‌ربڕین ٢. ده‌نگه‌ده‌نگ؛ زلـه؛ قـاوقیژ ٣. [تعریض] هۆ؛ هه‌ی (بۆ ده‌نگدان) ‹هو! مواظب باش! پامو له کردی: هۆ! وریای خۆت به! پامت پان کرده‌وه›.

◙ هو کردن: هووکردن؛ هوو لێ‌کردن؛ به ده‌ردانی ده‌نگی هوو نارِه‌زایه‌تی ده‌ربڕین و تیز و گاڵته پێ‌کردن ‹مردم سخنران را هو کردند: خه‌ڵکی وتاربێژه‌که‌یان هوو کرد›.

هو کشیدن: هووکێشان ‹یک دقیقه همه هو کشیدند: خوله‌کێک، به‌تێکڕا هوویان کێشا›.

**هوا** / havā /: [عربی] اسم. هه‌وا: ١. کـژ؛ تێکه‌ڵی نادیار و بێ‌بۆنی گازی جۆراوجۆر (وه‌کوو نیترۆژن و ئوکسیژن) له که‌شی زه‌ویدا ‹در و پنجره را باز کن هوا عوض شود: درگا و په‌نجه‌ره‌که بکه‌وه با هه‌وا تازه بێته‌وه› ٢. [مجازی] حـه‌وا؛ حـه‌وه‌یلێ؛ ئاسمـان؛ حه‌واو؛ به‌رانبه‌ر: **زمین** ‹پرنده در هوا پرواز می‌کرد: باڵنده به هه‌وادا ده‌فڕی› ٣. [مجازی، گفتاری] پلـه؛ ده‌رجه؛ نمره ‹قدش یک هوا بلندتر است: بـالای هه‌وایه‌ک به‌رزتره› ٤. [گفتاری] هـۆش؛ وشیاری؛ ئاگه‌داری؛ وریایی؛ چاوه‌دێری ‹هوای کارش را داشته باش!: ده‌ست به کاره‌که‌یه‌وه بێ!› ٥. [مجازی] تاسه؛ ئه‌لها؛ ئه‌ڵها؛ ئاڵها؛ کورکه؛ هاش؛ حه‌ز؛ خواست؛ ئاوات و ئاره‌زوو ‹دلم هوای شهرم را کرده بود: دلم تاسه‌ی شاره‌که‌مانی کردبوو›: **هوی** ٦. دۆخی که‌ش و هه‌وا ‹هوا بارانی است: هه‌وا بارانیه› ٧. ئاو و هه‌وا ‹هوای کویری: هه‌وای که‌ویری› ٨. [مجازی، گفتاری] بار؛ هه‌ل و مه‌رج؛ بار و دۆخ؛ دۆخی شوێنێک ‹هوا پس است: باره‌که ناله‌باره›.

◙ هوای آزاد: هه‌وای ئازاد؛ شوێنێکی سه‌رباز و ده‌ورنه‌گیراو که له‌وێدا هه‌وا به باشی دێت و ده‌ڕوا.

هوای آفتابی: خۆره‌تاو؛ خوه‌ره‌تاو؛ وه‌ره‌تاو؛

تاو؛ دۆخێ کە ئاسمان بێهەورە و خۆری تێدا دیارە. هەروەها: **هوای ابری؛ هوای برفی**

**هوای خفه**: خەف؛ هەوای ڕاوەستاو کە هەناسەدانی تێیدا ئەستەمە: **هوای سنگین**

**هوای دم کرده**: بۆق؛ هەڵم؛ هەوای گەرم و هەڵماوی.

**هوای سنگین** ☜ **هوای خفه**

**هوای صاف**: ساماڵ؛ سا؛ ساو؛ سایەقە؛ ئاسمانی بێهەور.

**هوای گرگ ومیش**: بوومەلێڵ؛ شەوەکی؛ بوولێڵە؛ شەو و ڕۆژان؛ تاریکی و ڕۆشنایی تێکەڵ؛ سەرەتای بەربەیان یان ئێوارە.

**به هوای چیزی/ کسی**: بە تاسەی/ بە هەوای شتێ/ کەسێکەوە؛ چاوەڕوان بوونی شتێ یان کەسێک ‹به هوای تو آمده بود: بە تاسەی تووەوە هاتبوو›.

◘ **هوا برداشتن**: *[مجازی]* خەیاڵ هەڵگرتن؛ سوار ئەسپی با بوون؛ لێکەوتن؛ خەیاڵاوی بوون ‹هوا برش داشته بود گویا می‌خواهند او را رییس کنند: خەیاڵ هەڵیگرتبوو گوایە دەیانەوێ بیکەنە سەرۆک›.

**هوا پس بودن**: *[مجازی، گفتاری]* بار/ بار و دۆخ/ هەوا نالەبار بوون؛ بار و دۆخ خراپ بوون ‹وقتی دید هوا پس است، فرار کرد: کە دیتی بار و دۆخ نالەبارە، هەلات›.

**هوا خوردن**: هەوا خواردن؛ هەوا لێکەوتن: ١. هەوا دان؛ کەوتنە بەر ڕەوتی هەواوە ‹لباسها را پهن کن، کمی هوا بخورند: لیباسەکان هەڵخە توزێ هەوا بخۆن› ٢. هەواخوەری کردن ‹رفتم کمی هوا بخورم: ڕۆشتم نەختێ هەوا بخوەم›.

**هوا دادن**: دانە پا؛ دانە بەر هەوا؛ هەڵخستن؛ بەر هەوا دان/ خستن ‹رختخوابها را هوا داد: نوێنەکانی دایە با›.

**هوا کردن**: *[گفتاری]* هەڵدان؛ حەوا دان؛ خستنە حەوا ‹بچەها بادبادک هوا کردند: منداڵەکان بەرزەحەوایلەیان هەڵدا›.

**هوای چیزی به سر کسی زدن/ افتادن**: *[مجازی]* بیر/ هەوای شتێ کەوتنە سەر کەسێ؛ خەیاڵی شتێ دانە سەری کەسێک ‹هوای شهر به سرش زده بود: هەوای شار کەوتبووە سەری›.

**هوای چیزی/ کسی را داشتن**: *[مجازی]* هۆش بە شتێک یان کەسێکەوە بوون؛ ئاگا لە شتێ/ کەسێک بوون ‹تو برو، من هوایش را دارم: تۆ بڕۆ من هۆشم پێوەیە›.

**هوای چیزی/ کسی را کردن**: تاسەی کەسێ/ شتێ کردن ‹دلم هوای تو کرده: تاسەتم کردووە›.

**به هوا پریدن**: هەڵخستنەوە؛ هۆرەوە وسەی؛ هەڵپەڕینەوە ‹از شادی به هوا پرید: لە خۆشیدا هەڵیخستەوە›.

**به هوا رفتن**: چوونە ئاسمانا؛ لوەی ئاسمانەرە؛ لە بەین چوون؛ نوقم بوون؛ فەوتیان ‹دود شدن و به هوا رفتن: بوونە دووکەڵ و چوونە ئاسمانا›.

**هوائی** / havā'î/: [عربی] ☜ **هوایی**

**هوابر** / havābar ، ـها/: [عربی/ فارسی] *اسم.* هوود؛ هەوابەر؛ کەرستەی کارەبایی بۆ هەڵکێشانی هەوا و دەرکردنی بۆن و دووکەڵ.

**هوابرد** / havābord/: [عربی/ فارسی] *اسم.* ئەو چەکدارانەی بە فڕۆکە بۆ شەڕ دەبرێن و بە چەتر دادەپەڕن.

**هوابند** / havāband/: [عربی/ فارسی] *صفت.* (بەر) هەواگر؛ هەوابڕ؛ بەتایبەتمەندی و لەبار بۆ بەرگرتنی هەوا.

**هوابندی** / havābandî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* هەوابڕی؛ کاری کەرستە یان ئاقارێک بۆ بڕینی هاتوچۆی هەوا.

**هواپرست** / havāparast ، ـان/: [عربی/ فارسی] *صفت.* هەواپەرست؛ هەوایی؛ هوکارە و هۆگری لە

دووی حەز و هەوای دەروون چوون. هەروەها: **هواپرستی**

**هواپیما** / havāpeymā ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. فڕۆکە؛ باڵافڕ؛ تەیارە؛ تیارە؛ کەرستەی گواستنەوەی هەوایی، کە بە کاردانەوەی دینامیکی لە هەوادا دەفڕێ.

◘ هواپیمای اطلاعاتی: فڕۆکەی سیخوڕی؛ فڕۆکەی شۆفاری.

**هواپیمای بمب افکن**: فڕۆکەی بۆمهاوێژ؛ تەیارەی بومبڕێژ.

**هواپیمای بی‌موتور** ☜ **گلایدر**

**هواپیمای شکاری**: فڕۆکەی شەڕڤانی؛ فڕۆکەی تایبەت بۆ شەڕ لەگەڵ فڕۆکەی دژمن.

**هواپیماربا** / havāpeymārobā ، ـیان/: [عربی/ فارسی] /اسم. فرۆکەڕفێن؛ فڕۆکەدز؛ تەیارەدز. هەروەها: **هواپیمارِبایی**

**هواپیمایی** / havāpeymāyî/: [عربی/ فارسی] ☜ **هوایی**[1] ــ ٣

**هواخواه** / havāxāh ، ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. هەوادار؛ لاگر؛ داژدار؛ هەواخوا؛ خواهان؛ پشتیوان؛ پاڵوبەن؛ خوازیار؛ لایەن‌گیر؛ لایەنگر؛ هۆگر.

**هواخواهی** / havāxāhî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. لاکۆشکە؛ لاکۆشی؛ هەواخوایی؛ هۆگری؛ لاگری؛ داژداری؛ پشتیوانی؛ هەڤالداری.

**هواخوری** / havāxoî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. هەواخۆری؛ هەواخوەری؛ هەواوەری؛ کار و ڕەوتی کەڵک وەرگرتن لە هەوای تازە.

**هوادار** / havādār ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. داژدار؛ لایەن‌گر؛ لایەن‌گیر؛ ئاگادار؛ پارێزدار؛ یەوودەست؛ هۆگر؛ هەوادار؛ تەنخوا؛ لە سەر؛ پشتیوان؛ پاڵوبەن ‹هوادار کردستان؛ هوادار اسلام: لایەنگری کوردستان؛ هۆگری ئیسلام›.

**هواداری** / havādārî ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. لایەنگری؛ لایەنگیری؛ هۆگری؛ پشتیوانی؛ لاکۆشکە؛ لاکۆشی؛ داژداری: ١. کردەوەیێ کە نیشاندەری پشتیوانی لە کەس یان شتێکە ٢. کردەوەیێ کە نیشاندەری لایەنگری‌کردن لە لایەنێکی شەڕ و کێشەیە.

**هوار** / havār ، ـها/: اسم. [گفتاری] ١. های؛ هاوار؛ هەرا؛ قیرە؛ قێڕە؛ قاڵ؛ گاڵ؛ بانگ؛ هەی‌هاوار؛ دا و بێدا؛ داد و بێداد ٢. کەلاوە؛ ئاوار؛ لاوار؛ دار و پەردوو؛ سەخمە؛ هەڕفتە.

◘ هوار زدن ☜ **هوار کشیدن**

هوار شدن: ڕووخان؛ ڕمیان؛ ڕمان؛ وڕای؛ وڕەی؛ داتەپین؛ ڕمیای؛ ئەرەوڕیەی ‹سقف روی سرش هوار شد: بانەکە بە سەریدا ڕووخا›.

هوار کشیدن: هاوارکردن؛ گاڵ‌کەردەی؛ بانگ و هەرا کردن؛ دا و بێدا کردن ‹دیگر چرا هوار می‌کشی؟: ئیدی بۆچی هاوار دەکەی؟›: **هوار زدن**

**هوازدگی** / havāzadegî/: [عربی/ فارسی] /اسم. ١. بیماری ارتفاع ☜ **بیماری** ٢. هەواکەوتەیی؛ شوێنەواری وەزەنی هەوا بە سەر شتێکدا (وەک ژەنگ هێنانی ئاسن).

**هوازی** / havāzî ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] صفت. *[زیست‌شناسی]* هەواژی؛ تایبەتمەند و هۆکارە بە ژیان لە هەوادا.

**هواسر** / havāsor/: [عربی/ فارسی] ☜ **گلایدر**

**هواسنج** / havāsanc ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. هەواپێو؛ کەش‌پێو؛ کەرستەیەک بۆ پێوانی تۆکمەیی هەوا و گاز.

**هواشناسی** / havāšenāsî/: [عربی/ فارسی] /اسم. هەواناسی؛ هەواشناسی؛ کەشناسی؛ زانستی لێکدانەوەی دیاردەگەلی کەش (وەک هەور، با، باران، گەرما، سەرما). هەروەها: **هواشناس**

**هواکش** / havākeš ، ـها/: [عربی/ فارسی] /اسم. هەواکێش: ١. دەراوێک بۆ دەرچوونی هەوا لە شوێنێکی سەربەستەدا ٢. هەوابەر؛ کەرستەیەکی وەک پەنکە بۆ ڕاوەنانی هەوای

خراپ و هێنانە ژووری هەوای باش.

**هـــواگیری** / havāgîrî/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. هەواگیری؛ کار و ڕەوتی دەرکردنی هـەوای نێـو دەزگایەک.

**هوانـاو** / havānāv ، ـهـا/: [عربـی/ فارسـی] ☜ **هاورکرافت**

**هوانورد** / havānavard ، ـها؛ ـان/: [عربی/ فارسی] /اسم. فڕۆکەوان؛ فڕۆکەڤان؛ لێخـوڕی کەرسـتەی گواستنەوەی هەوایی.

**هوانوردی** / havānavardî/: [عربی/ فارسـی]/اسم. ١. زانسـت و پیشـەی سـەر بـە کەرەسـتەی گواستنەوەی هەوایی ٢. فڕۆکـەوانی؛ زانسـت و لێزانی ئاژۆتنی کەرەسەی گواستنەوەی هەوایی ٣. فڕۆکەوانی؛ کار یان پیشەی فڕۆکەوان.

**هـــوانیروز** / havānîrûz/: [عربـی/ فارسـی]/اسـم. یەکەی هەوایی هێزی زەوینی.

**هـــوایی**[1] / havāyî/: [عربـی] صـفت. هــەوایی: ١. پێوەندیدار یان سـەر بـە بـەرزتر لـە ئاسـتی زەویــن ‹انـدامهای هـوایی: ئەندامگـەلی هـەوایی› ٢. سەر بـە فڕۆکـەوانی ‹نیـروی هـەوایی: هێـزی هەوایی› ٣. فڕۆکەیی؛ پێوەندیدار یـان سـەر بـە فڕۆکـە ‹شـرکت هـوایی: دابەشـگەی هـەوایی›: **هواپیمـایی** ٤. [گفتـاری] هـەوایی؛ بـایی هـەوا؛ شـەیدایی؛ ئـاوەز تێکچـوو، هـۆش لـێ بـڕاو؛ سەرلێشێواو ‹از عشق دختر پاک هوایی شده بود: لـە ئەوینی کچەکەدا تەواو هەوایی ببوو› * **هوائی**

**هوایی**[2]: قید. ١. هەوایی؛ بەرەو ئاسمان ‹هەوایی شلیک کرد: هەوایی گوللـەی دەرکـرد› ٢. [گفتـاری] هـاکۆ؛ هـەیکۆ؛ وەهـاکۆ؛ ڕەمـەکی؛ لـە خـۆوە ‹این‌طور هوایی حرف نزن!: ئاوا هاکۆ قسە مەکـە!› * **هوائی**

**هـــوبره** / hûbare ـــهــا/: اسـم. میشەسـی؛ مێشەسپی؛ چێـرک؛ چـرک؛ چێـرگ؛ چیـڕگ؛ چرگ؛ هـودەرە؛ هـوەوەرە؛ هـوووەرە؛ تـودەرە؛ هۆوهرە هۆورە؛ گەڤرک؛ باڵـندەیەکی وشـکەژیە بە مل و پای درێژ، باڵی پان، دندووکی ئەستوور و هێندێک پانەوە کە لە سەر زەوی هێلانە دەکا و نێر و مێوینەی لە یەک ناچن.

**هوچی** / howčî, ho:čî ، ـها؛ ـان/: [فارسی/ ترکی] صفت. ئاژاوەچی؛ ئاژاوەگێڕ؛ بـە شـەڕوگەڕ ‹افـراد هوچی فرصتی یافتند تا هرچـه دلشـان خواسـت بکننـد: ئاژاوەچیـەکان هـەلێکیان بـۆ ڕەخسـا تـا هـەرچی ویستیان بیکەن›.

**هوچیگری** / howčîgarî, ho:čî- ، ـها/: [فارسـی/ ترکـی/ فارسـی]/اسـم. ئاژاوەگێـڕی؛ شـەڕوگەڕی؛ ترۆکاری؛ کار و ڕەوتی بشێوە نانەوە و جـەنجاڵ کردن.

**هود** / hûd ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. هوود؛ هەوابـەر؛ کەرستەیەک بە سەر کوانـوو یـان ئوجاقـەوە بـۆ هەڵکێشان و دەرکردنی هەڵم، بۆق، بۆن و چڕ و چەوری نێو چێشتخانە.

**هــودج** / hûdac, ho(w)dac ، ـهـا/: [معـرب از کـردی]/اسـم. [قـدیمی] کـەژاوە؛ کیـژاوە؛ مەئافـە؛ کورسیئاسایەک بۆ دانیشـتنی ڕێبـوار لـە سـەر چوارپێ یان لە سەر شانی باربەرانەوە.

**هوده** / hûde/: اسم. [نامتداول] هۆ؛ خۆ: ١. کەڵ؛ بـەهرە؛ فایـدە؛ بـارە؛ کەڵـک؛ قـازانج؛ بەرهـەم ٢. ئاکام؛ سەرئەنجام؛ داهات.

**هورا** / hûrā/: [فرانسوی] صوت. هوورا؛ هـۆرا؛ وڕا؛ بژی؛ دەنگی کۆمەڵ بۆ ئافەرین لە کەسێ.

◘ هـورا کشـیدن: هـوورا کێشـان ‹مـردم بـرای سـخنران دسـت زدنـد و هـورا کشـیدند:خەڵـک بـۆ وتاربێژەکە چەپڵەیان لێدا و هوورایان کێشا›.

**هورت** / hort/ ☜ **هُرت**

**هـــورمن** / hormon ، ـهــا/: [فرانسـوی]/اسـم. هورمون: ١. [فیزیولوژی] بەرهەمی ئـالی خانـەی زیندوو کە بە تراوی نێو لەش یان شیرەی گیادا دەگـەڕێ و کـاری خانـەکان خێـرا دەکاتـەوە ٢. بەرهـەمی دەسـتکری هورمـون * **هُـرمُن؛ هورمون**

**هورمون** / hormon/: [فرانسوی] ☜ **هورمۆن**

**هـوز** / havvaz/: [عربـی]/سم. هـەووەز؛ نێـوی دووهەمین گرۆی پیتی ئەبجەد.

**هـوس** / havas ، ـهـا/: [عربـی]/سم. هـەوەس؛ ئیشتیا؛ ئەلیا؛ ئالها؛ ئـەلها؛ کەلکـەل؛ کەلکەڵـە؛ کەڵکەڵە؛ خولیا؛ قرم؛ خیتک؛ هەژ؛ هـەز؛ حـەز؛ واز؛ هاش؛ گێول؛ فلووف: ١. ئـارەزووی کـاتی و زوو ڕابر ٢. *[مجازی]* هۆک؛ ئیشتیای گان.

▣ هوس کردن: ١. مـرخ خـۆش کـردن؛ تـەماح کردن؛ قرم خۆش کردن؛ نـۆس کـردن؛ لـووت خوریـان؛ کەوتنـە سـەر ٢. ئیشـتیا کـردن؛ ئـارەزووکردن ‹هـوس قورمـەسـبزی کـرده‌ام: ئیشتیای سەوزیقاورمەم کردووە›.

به هوس انداختن: ئیشتیا بزواندن ‹بـوی کبـاب رهگـذران را بـه هـوس مـی‌انداخت: بـۆی کـەباب ئیشـتیای ڕێبـوارانی دەبزوانـد›. هـەروەها: **بـه هوس افتادن**

**هوس انگیز** / havasangîz/: [عربی/ فارسی] صفت. هۆکاوی؛ حەزاوی؛ هەوەساوی؛ ئالۆشاوی؛ هـۆی هاندانی حەزی جینسی.

**هوسانه** / havasāne/: [عربی/ فارسی] ☜ **ویارانه**

**هوسـباز** / havasbāz ، ـها؛ ـان/: [عربـی/ فارسـی] صفت. دڵچەڕان؛ دڵبزۆک: ١. بە ئالۆش؛ زەنەک (بۆ پیاو)؛ حەشەری (بۆ ژن)؛ شاوەتی ٢. فلووفـا؛ بە حەز و ئارەزووی زوو ڕابر و کاتیەوە.

**هوسبازی** / havasbāzî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/سم. دڵــچەڕێنی؛ دڵــبزۆکی: ١. کــار و ڕەوتی دڵــچەڕاندن ٢. دۆخ یــان چۆنیــەتی خــۆش ڕابواردن؛ لە دووی حەزکەوتن، بەبێ لەبەر چـاو گرتنی داب و نەریتی کۆمەڵگا.

**هوسـران** / havasrān/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. دڵچەڕان؛ دڵچەڕێن؛ هەوەسباز؛ خۆشڕابوێر.

**هوسرانی** / havasrānî ، ـها/: [عربی/ فارسی]/سم. دڵچەڕێنی؛ دڵچەرانی؛ خـۆشڕابـوێری: ١. دۆخ یـان چۆنیـەتی خـۆش ڕابـواردن ٢. شـاوەتی؛ ئالۆشی؛ ئەلۆری.

**هوسـناک** / havasnāk/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. فلووفا؛ ئالۆشاوی؛ هۆکاوی.

**هوش** / hûš/:/سم. هۆش؛ بیر؛ ویـر؛ وێـر؛ منـە؛ وش؛ هێش؛ شەس؛ شەست؛ زەین: ١. توانـایی بەکارهێنانی زانیاری بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە دەگەڵ دەوروبەری خۆ یا خود بیرکردنەوەیەکی جیـاواز ٢. فام؛ فکر؛ هزر؛ توانایی فێر بوون، تێگەیشـتن یان ڕووبەڕوو بوونەوە دەگەڵ بار و دۆخـی تـازە یان ئەستەمدا ٣. ئاریش؛ ئاوەز؛ شـۆش؛ هـەش؛ هش؛ لێهـاتوویی بـیر و زەیـن بـۆ لێکدانـەوەی زانیـاری هەسـتی یـان وەرگـرتنی زانیـاری لـە جەهانی دەوروبەر.

▣ هوش مصنوعی: هۆشی دەسـکرد؛ لێهـاتوویی ماشینێک بـۆ لاسـاییکردنـەوەی کـردەوەی ژیرانەی مرۆڤ.

▣ هوش از سر کسی پریدن/ رفتن: *[مجازی]* بـیر و هۆش بۆ کەسێک نـەمان؛ هـۆش لـێبـڕان؛ سەر کەسێ سـوورمان ‹از دیـدن آن همـه پـول هوش از سرش پرید: لە دیتنی ئەو هەمکە پارەیـە، بیر و هۆشی بۆ نەما›. هـەروەها: **هـوش از سـر کسی بردن**

از هوش رفتن: لە سـەر خـۆ چـوون؛ بێهـۆش بوون؛ خاوێر بوونـەوە؛ بوورانـەوە؛ ویـەردەیوە؛ سەروو وێ شیەی. بەرانبەر: **به هـوش آمـدن** ‹به زمین افتاد و از هوش رفت: کەوت و لەسەرخۆی چوو›.

به هوش آمدن: هاتنـەوە سـەر خـۆ؛ هاتنـەوە هۆش؛ وشیار بوونەوە؛ هاتنەوە هۆش؛ ئامـایوە هۆش. بەرانبەر: **از هوش رفتن** ‹بعد از دو روز بـه هوش آمد و توانست حـرف بزنـد: پـاش دوو ڕۆژ هەهاتەوە سەر خوی و توانی قسە بکا›.

به هـوش آوردن: هێنانـە هـۆش؛ هاوردنـەوە سەر خۆ؛ وشیار کردنـەوە؛ هۆشـیارەو کـردن؛ ئاگا کردنەوە؛ ئاردەیوە هۆش ‹به زور شوک او را

به هوش آوردند: بە زەبری شۆک هێنایانەوە هوش›.

**هوشبری** / hûšbarî/: *اسم. [پزشکی]* هۆشبەری: ١. کار و ڕەوتی بێهۆش‌کردن ٢. کۆمەڵە کار یان شێوەگەلی بێهۆش‌کردنی گیانەوەر، بەتایبەت مرۆ.

**هوشمند** / hûšmand ، ـان/: *صفت.* زیرەک؛ وشیار؛ وریا؛ مەژودار؛ بە ئاوەز؛ ژیر؛ مەزگدار؛ خاوەن مژگ؛ زرینگ؛ هایا: ١. بە هۆش و لێهاتوویی زەینی زۆرەوە ٢. بە بیر و هۆش؛ نیشاندەری دادوەری باش یان ئاوەز و بیری گەشاوە.

**هوشمندانه**[1] / hûšmandāne/: *صفت.* ژیرانە؛ بە ئاوەزەوە؛ بە مەزگداری؛ وریایانە ‹رفتار هوشمندانە؛ سخنان هوشمندانە: ئاکاری ژیرانە؛ وتەی ژیرانە›.

**هوشمندانه**[2]: *قید.* زیرەکانە؛ وریایانە؛ ژیرانە؛ بە بیر و هۆشەوە؛ ئاگایانە؛ بە هۆش و گۆش؛ بە وریایی؛ هاوڕێ دەگەڵ هۆش و توانایی زەینی ‹در رویارویی با مشکلات هوشمندانە رفتار می‌کرد: لە ڕووبەڕوو بوونەوە دەگەڵ کەندوکۆسپاندا، ژیرانە دەجووڵایەوە›.

**هوشمندی** / hûšmandî ، ـها/: *اسم.* وریایی؛ وشیاری؛ مەژوداری؛ ژیری؛ دۆخ یان چۆنیەتی بە هۆش بوون؛ بەئاوەز بوون.

**هوشی** / hûšî/: *صفت.* هۆشی؛ سەر بە هۆش ‹ضریب هوشی؛ بهرەی هوشی: بەرئەنجامی هوشی؛ بەهرەی هوشی›.

**هوشیار** / hûš(i)yār ، ـان/: *صفت.* وریا؛ وشیار؛ هۆشیار؛ هەدار؛ هایە؛ زرینگ؛ زرنگ؛ زیرەک؛ هایا؛ زەقەڵ؛ ئاگادار؛ هاگی‌دار؛ وسڵ؛ قوتە؛ لەسەرهەست؛ بەبیر؛ دلاوەدان؛ دڵ‌زیندە؛ چارچاڤ؛ چارچەش؛ بەهۆش؛ چراخ؛ ئەغیار؛ ئەیار؛ شەش‌بێدار؛ هەشار؛ شیار.

**هوشیاری** / hûš(i)yārî ، ـها/: *اسم.* وشیاری؛ هوشیاری: ١. ژیری؛ بەهرەمەندی لە هۆشی زۆر

٢. ڕەوتی کەڵک وەرگرتنی تەواو لە هەست بۆ وەرگرتنی زانیاری لە ڕووداوان.

**هوفاریقون** / hûfārîqûn/: [معرب از یونانی] ☜ **هزارچشم**

**هول**[1] / howl, ho:l/: [عربی] *اسم.* ترس؛ تەرس؛ تەرسی؛ سام؛ یاس؛ سوهن؛ ساو؛ هاس؛ باک؛ زەرتلاق؛ پڕی؛ خەزە؛ قورف؛ چورچ؛ چرچ؛ هەراس؛ سیم؛ تاو؛ زیەڵە؛ زار؛ زراو؛ زاور؛ تناب.

**هول**[2]: *صفت. [گفتاری]* هەوڵ؛ هوول؛ هوویل؛ شڵەژاو؛ پەشۆکاو؛ سەرسام؛ دەسەپاچە؛ سەرلێ‌شێواو؛ سەراسیمە؛ لەبکۆک؛ سەرلێ‌تێکچوو.

▣ **هول شدن**: هەوڵ بوون؛ سەر لێ شێوان؛ سەرلێ‌تێکچوون؛ هۆش بلاو بوون؛ لەبکین؛ خەبسین؛ پەشۆکان؛ پەشۆکیەی؛ پەشێویای؛ شێویان؛ پەشێو بوون ‹هول شده بود، نمی‌دانست چه بکند: هەوڵ ببوو، نەیدەزانی چبکا›.

**هول کردن**: ١. شڵەژان؛ ترسان؛ زاڵەترەک بوون؛ بە هۆی ترسی زۆرەوە وشیاری خۆ لە دەست دان ‹بچه هول کرده، کمی نمک بدهید بلیسد: ئەو منداڵە شڵەژاوە، نەختێ خوێی بدەنێ بیلێسێتەوە› ٢. هەوڵ کردن؛ لەبکاندن؛ پەشۆکاندن؛ پەشۆکنەی؛ سەر لێ شێواندن؛ تووشی هەشتاو و سەرلێ‌شێواوی کردن ‹هولش نکنید! بگذارید فکر بکند: هەولی مەکەن! لێی‌گەڕێن با بیر بکاتەوە›.

**از هول هلیم توی دیگ افتادن**: *[کنایی]* لە تاو زگ دەم سووتان؛ لە بەر هەڵپە و چاوچنۆکی، تووشی زەحمەت بوون ‹بیچاره از هول هلیم توی دیگ: بەستەزمان لە تاو زگی دەمی سووتا›.

**هول‌انگیز** / howlangîz, ho:l-/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ترسناک؛ خۆفناک؛ خەوفناک؛ سامناک؛ ترسێنەر؛ بەسام؛ سامدار؛ زەرندە.

**هولناک** / howlnāk, ho:l-/: [عربی/ فارسی] *صفت.* سامناک؛ ترسناک؛ ترسێنەر؛ بەسام؛

بسەهم؛ زەرندە؛ بە هەیبەت؛ گیانسووچ؛ سامدار.

**هولوسن** / holosen/: [فرانسوی]/اسم. [زمین‌شناسی] هولوسێن؛ یەکەمین خول لە دەورانی چوارەمی زەویناسی: **هُلوسن**

**هولوگرافی** / holog(e)rāfî/: [فرانسوی]/اسم. هولوگرافی؛ شێوەی دروستکردنەوەی وێنەی سێبەر لە سەر فیلمی وێنەگەری بە تیشکی لەیزر.

**هولوگرام** / holog(e)rām/: [فرانسوی]/اسم. هولوگرام؛ وێنەی دروستکراوەی سێبەر بە شێوەی هولوگرافی.

**هول و ولا** / howl-o-valā, ho:l-/: [عربی]/اسم. [گفتاری] دڵەڕاوکێ؛ دڵەتەپێ؛ ترس و نیگەرانی ‹با این خبر همه را به هول و ولا انداختی: بەم هەواڵە هەمووت خستە دڵەڕاوکێوە›. هەروەها: **به هول و ولا افتادن؛ به هول و ولا انداختن**

**هول هولکی** / holholakî/: قید. [گفتاری] پەلەپەل؛ هەولەهەول؛ هەلمەهەلم؛ بریو- بریو؛ بەلەز؛ بەپەلە ‹هول‌هولکی غذا خورد و رفت: بەپەلە نانی خوارد و ڕۆشت›.

**هوله** / ho(w)le، ـها/: [؟]/اسم. خاولی؛ خاڤلو؛ هەولە؛ حەولە؛ مەرحەمە.

**هوم** / hûm/: صوت. [گفتاری] ئێ؛ بەڵێ؛ ئەرێ؛ ئم؛ ئەهە؛ وشەی پشتگری یان پێداگری.

**هومئوپاتی** / home'opātî/: [انگلیسی] ☜ **هُمئوپاتی**

**هونگ** / havang/ ☜ **هاوَن**

**هوو** / havû، ـها/: اسم. هەوو؛ هەوێ؛ هەڤی؛ هەوە؛ هەنە؛ هامشوو؛ هەوگ؛ ئەنە؛ وسنی؛ وەسنی؛ ژنێ کە لەگەڵ ژن یان ژنانیتر مێردێکی هەیە.

▣ هوو آوردن به سر کسی: هەوو/ ژن هێنانە سەر کەسێک؛ هەوێ سەروو پۆینە ئاردەی ‹خبر شد که شوهرش می‌خواهد به سرش هوو بیاورد: خەبەریان دا مێردەکەی دەیەوێ هەوو بهێنێتە سەری›. هەروەها: **هوو آمدن به سر کسی**

**هوودار** / havûdār/: صفت. هەوێبار؛ هەوەسار.

**هووداری** / havûdārî/: اسم. هەوەساری؛ هەوێباری؛ هەڤینی؛ هەوینی.

**هو و جنجال** / hov-o-cancāl/: اسم. [گفتاری] هەراوهوریا؛ هەرا و هاوار؛ گوڕە و هەرا؛ چەقە و هەرا؛ هەلەبەل؛ قوولاقوول؛ شەڕهۆمللێ؛ شەماتە؛ دەنگ و دۆر؛ هەرە و مەزات؛ زڵەزڵ؛ زەنا ـ زەنا؛ گاڵەگاڵ؛ هەللا- هەللا؛ چەقەچەق؛ گوڕەو چەقە؛ گرم و قاڵ؛ قڕە و مشە؛ قرم و قاڵ؛ هەرا و جەنجاڵ.

**هوی** / havā/: [عربی] ☜ **هوا ـ ٥**

**هویت** / hovîyyat/: [عربی]/اسم. پێناس؛ شوناس: ١. ئەوەی کەسێکی پێوە دەناسرێ و هۆی جیاوازی لە دیترانە (وەک ناو، ناوی باوک و...) ٢. تایبەتمەندی کەسایەتی و فەرهەنگی کەس کە لە دیترانی جوێ دەکاتەوە.

**هویج** / havîc، ـها/: [از عربی]/اسم. گێزەر؛ گزەر؛ گەزەر؛ گزر؛ گزەرکی؛ یارکۆک؛ هەویج: ١. ئالفەگیایەکی دووساڵانەیە بە ڕیشەی ڕاست و ئەستوور و لقی ساف و گەڵای بڵاو و گوڵی چکۆلەی سپی کۆمەڵ وەکوو چەترەوە ٢. بنی ئەو گیایە کە گرۆڤەرێکی ئەستووری نارنجی یان نارنجی مەیلەو زەردە و دەخورێ.

**هویج‌پلو** / havîcpolow, -polo:/: [از عربی/ فارسی]/اسم. هەویج‌پلاو؛ گزەرپلاو؛ جۆرێ پلاو بە گۆشت و مرەبای گەزەرەوە.

**هویدا** / hoveydā/: صفت. [ادبی] دیار؛ ئاشکرا؛ دیتبار؛ خویا؛ دیارمان؛ هاینە؛ بەرچاو؛ خوانە؛ خوانی ‹شادی عمیقی در سیمایش هویدا بود: خۆشیەکی بێ‌بن لە سیمایدا دیار بوو›.

**هویه** / hoviye، ـها/: [؟]/اسم. هەویە؛ کەرستەی لەحیمکاری بە تینی ناوەکی (کارەبا) یان دەرەکی (ئاگر)ەوە.

هی / hey/: قید. *[گفتاری]* پەساپەس؛ لە پەستا؛ هەر؛ حەر؛ لێکدا ـ لێکدا؛ پەیتا ـ پەیتا؛ سەرەمڕ ‹هی حرف می‌زد و همه راخسته کرده بود: پەساپەس قسەی دەکرد و هەمووی هیلاک کردبوو›.

هی : صوت. *[گفتاری]* هەی: ١. هۆی؛ هۆ؛ ئۆ؛ هەو؛ هەی؛ ئەهەی (بۆ بانگ کردنی کەسێک) ‹هی! با تو هستیم: هەی! دەگەڵ تۆمانە› ٢. هەیٚ؛ هەچە؛ وەحە؛ هنگ؛ ئوش؛ دەنگێ بۆ لێخوڕینی چوارپێ ‹گوسفندان را هی کرد و برد: هی لە پەزەکان کرد و بردنی›.

◘ هی زدن: هەی لێ کردن؛ هەرا لێکردن؛ هاوار لێ کردن؛ هەرا کردن لە کەسێ بۆ ئاگا کردنەوەی لە مەترسی.

هی کردن: هەی کردن؛ حەی کردن؛ هەی لێکردن؛ هێ کردن؛ هەرا کردن؛ تێ خوڕین؛ بە هاوار لێخوڕین.

**هیات** / hay'at/: [عربی] ☜ **هیئت**

**هیاکل** / hayākel/: [عربی] جمعِ ☜ **هیکل**

**هیاهو** / hayāhû/: اسم. دەنگەدەنگ؛ هەرا و هوریا؛ قاڵ؛ چەقەچەق؛ زیڕەزیڕ؛ هەرا ـ هەرا؛ گرم و قاڵ؛ قاڵقوو؛ گاڵ و قوو؛ قاڵمەقاڵم؛ قاڵەقاڵ؛ هەرا و زەنا؛ خوڵخوڵە؛ هەرا و چەقە؛ قواقو؛ ڕوکلە؛ سنگەسنگ؛ سرمەسرم؛ هاوها؛ های‌هو؛ زەنا و چەقە؛ هەرا و دەنگ؛ زەنگ و قۆڕ ‹ناگهان هیاهو بلند شد: لەپڕا هەرا و هوریا بەرزەوە بوو›.

**هیئت** / hey'at/: [عربی] اسم. ١. ـها/ شاند؛ دەستە؛ لێژنە؛ وەفد ‹هیئت اعزامی بە کنگرە: شاندی ناردراو بۆ کونگرە› ٢. بیچم؛ نژم؛ شێوە؛ تووز؛ شکڵ و هەندام ‹بە هیئت یک شیر: بە بیچمی شێرێک› ٣. لقێ لە زانستی جوگرافیا کە بە ئەندازەگرتنی لایەنەکانی گۆی زەویەوە دەپەرژێ ٤. لقێک لە زانستی ئەستێرەناسی کە لە شوێن و مەودا و ئەندازەی هەسارە و گەڕۆکان دەکۆڵێتەوە ٥. ـها/ تەلمیس؛ دەستەی تایبەت بۆ شینگێڕی ئایینی (زۆرتر لە ناو شیعەدا) ✽ **هیأت**

◘ هیئت اعزامی: شاند؛ دەستە/ وەفدی ناردراو.

هیئت امنا: لێژنەی دەسپاک؛ دەستەی باوەڕ پێ کراو؛ تاقمێ جێ‌ڕێز و بڕوای هەمووان کە کاری هەڵبژاردنی بەڕێوەبەرانیان لە ئەستۆدایە.

هیئت تحریریە: دەستەی نووسیاری/ نڤیسیاری؛ وەفدی نووسەران/ نڤیسین؛ لێژنەی نووسەران.

هیئت دولت: لێژنەی دەوڵەت؛ بریتیە لە سەرۆک کۆمار یان سەرەک وەزیر و وەزیرەکانی.

هیئت رئیسە: لێژنی بەرپرس/ سەرۆکایەتی.

هیئت مدیرە: لێژنە/ دەستەی بەڕێوبەرایەتی.

هیئت نمایندگی: دەستەی نوێنەرایەتی؛ لێژنەی نوێنەران.

**هیبت** / heybat/: [عربی] اسم. سام؛ ساو؛ ساوێر؛ ساهمەک؛ هەیبەت؛ حێوەت: ١. ترسی هاوڕێ لەگەڵ ڕێزدا کە کەسێک لە دیتراندا بەدی دێنێ ٢. خۆف؛ ترسی زۆر ٣. جەلال؛ گەورەیی؛ شکۆ.

◘ هیبت کسی دیگران را گرفتن: سامی کەسێک کەسانی دی گرتن ‹هیبت دبیر تازە، همەی بچەها را گرفتە بود: سامی ماموستای تازە، هەموو منداڵەکانی گرتبوو›.

**هیبرید** / hîbrîd ، ـها/: [فرانسوی] صفت. *[زیست‌شناسی]* دوورەگە؛ دوورەگەز؛ دوورە؛ دوڕاج؛ دوڕاجی؛ دڕاجە؛ مەلەز؛ دوورێژ؛ دوو تۆمە؛ دوورێژە؛ بەدی هاتوو لە دوو ڕەگەزی جیاواز.

**هیپرتونیک** / hîpertonîk/: [انگلیسی] صفت. *[شیمی]* پڕتەوژم؛ بە تەوژم؛ پڕفشار.

**هیپرون** / hîperon ، ـها/: [؟] اسم. *[فعل]* هیپیرۆن؛ لە گەردیلە بنەڕەتیەکانی ئەتوم کە لە

پروتون و نوترون قورسترە بەڵام تەمەنی کەمترە.
**هیپنـــــوتیزم** / hîpnotîzm/: [فرانســـوی] ☜ **هیپنوتیسم**
**هیپنوتیزور** / hîpnotîzor، ـها/: [فرانسوی]/اسم. ئەو کەسەی کاری هیپنۆتیزم کردنە.
**هیپنوتیســـم** / hîpnotism/: [فرانســـوی]/اســم. هیپنۆتیسم؛ بار و دۆخـی خـەوی دەسـکرد کـە مرۆ دەسەڵاتی دەکەوێتە بەر کاریگەری کەسـی دی: **هیپنوتیزم**
**هیپوتالاموس** / hîpotālāmûs/: [فرانسوی]/اسم. هیپۆتالامووس؛ بەشی ژێرەوەی مێشکی نێوانی گوانداران کە لە ژێر تالامووسدایە و ناوەندەکانی ڕێکخستنی چالاکیە ناویستەکانی ژیان لـە خـۆ دەگرێ.
**هیپوتونیـــک** / hîpotonîk/: [فرانســـوی] صـفت. *[شیمی]* هیپۆتونیک؛ کەمتەوژم.
**هیپـــوفیز** / hîpofîz/: [فرانسـوی]/اسـم. هیپـۆفیر؛ لوویەکی خڕیلانە لـە سـەر ئێسـکی پەپوولـەیی کاپۆلـدا کـە بـە ئەنـدازەی فندقێکـە و هـەموو لووەکانیتری لەش ڕێبەری دەکا.
**هیپی** / hîpî، ـها/: [انگلیسـی]/اسـم. هیپـی؛ ئـەو لاوانـەی لـە دژی نـەریتی کۆمەڵـگای ڕۆژاوادا، جلی سەیر و سەمەرە لە بـەر دەکـەن و خۆیـان نائاسایی دەڕازێننـەوە و مـاک و دەوای سـڕکەر بەکار دێنن.
**هیتـــر** / hîter، ـهـا/: [انگلیسـی]/اسـم. هیـتیر؛ وەجاخی کارەبایی.
**هیتی** / hîtî/:/اسم. هـیتی: ١. /ـها؛ ـان/ هـۆزی سپی پێستی کەونارا کە لە هەزارەی دووهـەمی پێش لە زایین لە ئاسـیای بچـووک و سـووریادا دەوڵەتێکی بەهێزیان پێکەوە نابوو ٢. زمانی ئەو هۆزە؛ لە زمانەکانی هێندو- ئورووپایی.
**هیجان** / hayacān, hayecān، ـها؛ ـات/: [عربـی] /اسم. زیچ؛ هەیەجان: ١. کاردانەوەیەکی هەستی یان ئاکاری لـە بەرامبـەر دۆخێکـی چاوەڕوانی نـــەکراوەوە ٢. کاردانـــەوەی ڕەوانی و لەشـــی (وەکوو ترس) کە بە شـێوەی هەسـتێکی بـەهێز دەبێتە هۆی گۆڕانکاریەکی لەشی و ئامادە بوون بۆ چالاکیەکی دەسبەجێ.
**هیجان آور** / hayacānāvar, hayecān-/: [عربی/ فارسی] ☜ **هیجان انگیز**
**هیجـــان انگیـــز** / hayacānangîz, hayecān-/: [عربـی/ فارسـی] صـفت. ١. زۆر سـەیر و خـۆش ٢. هۆی بەدیهێنانی ئەو بار و دۆخە ✽ **هیجان آور**
**هیجانی** / hayacānî, hayecānî/: [عربی] صفت. هەیەجانی: ١. پڕ هەیەجان ‹فیلم هیجانی: فیلمی هەیـــەجانی› ٢. پێوەندیـــدار بـــە هەیەجانـــەوە ‹رفتارهای هیجانی: کردەوەگەلی هەیەجانی›.
**هیجده** / hîcdah/ ☜ **هجده**
**هیچ**[1] / hîč/: صفت. هیچ؛ حـیچ؛ هـۆچ؛ هـوویچ؛ هێچ؛ تو: ١. هیچوپووچ؛ مەراش؛ نەتشت؛ ژخـۆ؛ کەمبایەخ یان بێبایەخ ‹این کارها هیچ است: ئـەم کارانە هیچوپووچن› ٢. نەبوو؛ نەبووگ ‹هیچ کس اینجا نیست: هیچ کەسێک لێرەدا نیە›.
**هیچ**[2]: قید. هیچ؛ حیچ: ١. ئەرێ؛ هەر؛ ئایا؛ ئاخۆ ‹هیچ میدانی؟: هیچ دیـدەای؟: ئـەری زانیوتـە؟؛ هـەر دیوتـە؟› ٢. قـەت؛ قـەد؛ هـەر؛ هـەرگیز ‹هـیچ ندیـدەام؛ هـیچ نرفتـە بـود: قـەت نەمـدیوە؛ هـەرگیز نەڕۆشتبوو› ٣. زێدە لە وەش؛ زیاد لەوەش ‹پـول کتاب را کە نداد هیچ، پـولی هـم قـرض گرفـت: هـیچ پارەی کتێبەکەی نەدا، پارەشی لێم ساند!›: **هیچی** *[گفتاری]*
**هـیچ**[3]: ضـمیر. هـیچ؛ حـیچ؛ حیچیـە؛ هیچـێ؛ هیچێک؛ حیچێ؛ چ؛ چی ‹هرچە پرسیدند، من هیچ نگفتم: هەرچی پرسیان، من هیچم نەگوت›.
**هیچ**[4]: پیشوازە. هیچ- ؛ حیچ- ‹هیچکارە؛ هـیچکس؛ هیحیک: هیچکارە؛ هیچکەس؛ هیچکام›.
**هیچ چیز** / hîč.čîz/: ضمیر. هـیچشـتێ؛ هیچـێ؛ هووچ چیشت؛ هیچ چێو؛ هیچیە؛ حیشـتێ ‹آرام هیچ چیز نداشت: ئارام هیچشتێکی نەبوو›.

**هیچکاره** / hîčkāre/: *صفت.* هیچکاره: ١. بێ کار و پیشە ‹همەکاره هیچکاره است: هەمەکاره هیچکارەیە› ٢. بێدەسەڵات؛ دەستنەڕۆیشتوو؛ دەس‌نەلوا ‹او در آن اداره هیچکاره است: لەو مەرزینگەدا هیچکارەیە›.

**هیچکدام** / hîčkodām/ ☜ **هیچ‌یک**

**هیچکس** / hîčkas/: *ضمیر.* هیچ کەس؛ هووچکە؛ هیچکە؛ نەکەسێک ‹در آنجا هیچکس نبود: هیچکەس لەوێ نەبوو›.

**هیچگاه** / hîčgāh/: *قید. [ادبی]* قەت؛ قەد؛ هیچوەخت؛ هیچ‌کات؛ هیچکەی؛ هیچکای؛ هەرگیز؛ هەرگیزای‌هەرگیز؛ هەرگیزاوهەرگیز ‹او هیچگاه سفر نکرده است: قەت سەفەری نەکردووە›.

**هیچگرا** / hîčgerā، ـیان/: *صفت.* هیچواز؛ هیچخواز؛ هیچەوگر.

**هیچ‌گرایی** / hîčgerāyî/: *اسم.* هیچوازی؛ هیچخوازی؛ هیچ‌وپووچوازی؛ هیچەوگری: ١. بڕوا بەوەی کە بایەخێک نیە و ژیان بێخۆ و هیچ‌وپووچە ٢. ئایینێ کە ڕاستی و بەتایبەت ئاکار بە هیچ دەزانێ ٣. ئایینێ کە دەڵێ پێکهاتەی دنیا هێند خراپە کە بەر لە دروست کردنەوەی دەبێ کاول کرێ.

**هیچ‌گونه** / hîčgûne/: *قید.* بە هیچ جۆر؛ هیچ‌جۆرێ؛ هیچ‌کلووجێ؛ هیچ چەشنە؛ هیچ جۆرێک؛ هیچ جۆر.

**هیچمدان** / hîčmadān، ـان/: *صفت. [ادبی]* هیچنەزان؛ ناشارەزا؛ نائاگا ‹حالا شما از بندەی هیچمدان می‌خواهید که راهی پیش پایتان بگذارم؟!: ئێستە ئێوە لە منی هیچنەزان دەتانەوێ ڕێتان پێ نیشان بدەم؟!›.

**هیچ‌وقت** / hîčvaqt/: [فارسی/ عربی] *قید.* قەت؛ قەد؛ هەرگیز؛ هیچوەخت؛ هیچ‌کات؛ هیچکەی؛ هیچکا؛ هیچسات ‹هیچوقت او را ندیده‌ام: قەت نەیمدیوە›.

**هیچی**[1] / hîččî/ ☜ **هیچ**[2]**ـ٣**

**هیچی**[2]: *ضمیر. [گفتاری]* هیچ؛ حیچ؛ هیشتێ؛ هیشتێک؛ هیچێ؛ هیچێک ‹هیچی نگفت: هیچی نداشتم: هیچی نەگوت؛ هیشتێکم نەبوو›.

**هیچ‌یک** / hîčyek/: *ضمیر.* ١. هیچکام؛ هیچکامە؛ شتاق؛ نەیی: ١. دانەیێ؛ نەیەک‌لەمانە؛ هیچدانەی؛ هیچیۆ ‹هیچ‌یک از این کتاب‌ها به درد نمی‌خورد: دانەیێ لەم کتێبانە بە کار نایێ› ٢. کەس؛ هیچ کەس ‹هیچ‌یک از آنها خبر نداشت: کەسیان خەبەری نەبوو› ❋ **هیچکدام**

**هیدر** / hîder، ـها/: [فرانسوی] *اسم. [زیست‌شناسی]* هیدر؛ ئیدر؛ ساکارترین گیانەوەری پرخانەیی کە لە ئاوی شیریندا دەژی.

**هیدرات** / hîdrāt، ـها/: [فرانسوی] *اسم. [شیمی]* هیدرات؛ ئیدرات؛ ئەو ماکەی لەگەڵ ئاودا تێکەڵ بووە: **ئیدرات**

▣ هیدرات کربن: هەر مولکوولێکی پێکهاتوو لە کەربون، ئوکسیژن و هیدروژن (وەک شەکر، نیشاستە و سیلولوز): **کربوهیدرات**

**هیدراته** / hîdrāte/: [فرانسوی] *صفت.* هیدارتە؛ ئیدراتە؛ ماکی کیمیایی ئاودار: **ئیدراتە**

**هیدراسیون** / hîdrās(i)yon/: [فرانسوی] *اسم.* هیدراسیۆن؛ ئیدراسیۆن؛ تێک‌ئاڵان لەگەڵ ئاودا: **ئیدراسیون**

**هیدروالکتریک** / hîdro'elekterîk, -'elektirîk/: [فرانسوی] *صفت.* هیدرۆئیلێکتریک؛ پێوەندیدار بە وەرگرتنی بەرق لە ئاو: **ئیدروالکتریک**

**هیدروتراپی** / hîdrot(e)rāpî/: [فرانسوی] *اسم.* ئاودەرمانی؛ هیدرۆتراپی؛ ئیدرۆتراپی: ١. دەرمانی برێ نەخۆشی بە وەرزشی تایبەت لە ئاودا ٢. ڕەوشێکی تەندورستی بە خواردنەوەی ئاو: **ئیدروتراپی**

**هیدروتروپیسم** / hîdrot(e)ropîsm/: [فرانسوی] *اسم.* ئاوخوازی؛ ئاوەگری؛ هیدرۆترۆپیسم؛ تایبەتمەندیەک لە گیادا کە ئەبێتە هۆی بەخۆدا هاتن و گەشە کردن لە ڕاستەی ڕەوتی ئاودا:

**ئیدروتروپیسم**

**هیدرور** / hîdrûr/: [فرانسوی] ☜ **هیدرید**

**هیدرۆژن** / hîdrojen/: [فرانسوی]/اسم. هیدرۆژن؛ ئیدرۆژێن؛ ساکارترین و سوکترین توخمی کیمیاوی بە ژمارەی ئەتۆمی ١ و کێشی ئەتۆمی ١ کە گازێکی بێڕەنگ و بۆنە، زوو ئاگر دەگرێ و یەکێک لە دوو توخمی پێکهێنەری ئاوە و لە بژیشکی و پیشەسازیدا زۆر بەکەڵکە: **ئیدروژن**

▣ هیدرۆژن سنگین: دوتریوم؛ هیدرۆژنی قورس؛ ئیزۆتوپی یەک نوترۆنی هیدرۆژن.

**هیدروژناسیون** / hîdrojenās(i)yon/: [فرانسوی] /اسم. هیدرۆژێناسیون؛ ئیدرۆژناسیۆن؛ هیدرۆژندار کردنی برێ ماکی کیمیایی: **ئیدروژناسیون**

**هیدرۆژنش** / hîdrojeneš/: [فرانسوی]/اسم. هیدرۆژێنێش؛ ئیدرۆژێنێش؛ کار و ڕەوتی گرتنە ژێر کارتێکەری هیدرۆژنی ماکێکی کیمیایی یان تێکئالانی لەگەڵ هیدرۆژندا: **ئیدروژنش**

**هیدروژنه** / hîdrojene/: [فرانسوی] صفت. هیدرۆژندار؛ ئیدرۆژنە؛ بە ئەتومی هیدرۆژن لە ناو فرموولی کیمیاییدا: **ئیدروژنه**

**هیدروستاتیک** / hîdro('e)stātîk/: [فرانسوی] /اسم. هیدرۆستاتیک؛ لقێک لە زانستی میکانیک کە لە سەر دۆخی مەندی تراو و هێزەکانی سەر بەوە دەکۆڵێتەوە: **ئیدروستاتیک**

**هیدروسفالی** / hîdrosefāli/: [فرانسوی]/اسم. /پزشکی/ هیدرۆسیفالی؛ ئیدرۆسیفالی؛ دۆخی زۆر بوونەوەی تراوی نێو مێشک: **ئیدروسفالی**

**هیدروسفر** / hîdrosfer/: [فرانسوی]/اسم. هیدروسفیر؛ سەرجەمی ئاوگەلی زەوی: **ئیدروسفر**

**هیدروفویل** / hîdrofoyl ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. هیدرفۆیل؛ جۆرێ کەشتی کە بنەکەی تەختە و بە سەر ئاودا دەڕوا: **ئیدروفویل**

**هیدروفیل** / hîdrofîl/: [فرانسوی] صفت. هیدرۆفیل؛ ئاودۆس: **ئیدروفیل**

**هیدروکربن** / hîdrokarbon/: [انگلیسی]/اسم. /شیمی/ هیدرۆکەربون؛ ئیدرۆکەربون؛ پێکهاتەیەک لە کەربون و هیدرۆژن: **ئیدروکربن؛ ئیدروکربور؛ کربورهیدروژن؛ هیدروکربن**

**هیدروکربور** / hîdrokarbûr/: [فرانسوی] ☜ **هیدروکربن**

**هیدرولوژی** / hîdrolojî/: [فرانسوی]/اسم. ئاوناسی؛ هیدرۆلوژی؛ ئیدرۆلوژی؛ زانستی ناسینی ئاو: **ئیدرولوژی**

**هیدرولیز** / hîdrolîz/: [فرانسوی]/اسم. /شیمی/ هیدرۆلیز؛ ئیدرۆلیز؛ شی کردنەوەی شیمیایی بە ئاو.

**هیدرولیک** / hîdrolîk/: [فرانسوی]/اسم. هیدرۆلیک؛ ئیدرۆلیک؛ لقێک لە زانست و تەکنۆلۆجی کە لە سەر تایبەتمەندیگەلی فیزیکی و کەڵک گرتن لێیان دەکۆڵێتەوە: **ئیدرولیک**

**هیدرولیک**: صفت. هیدرۆلیکی؛ ئیدرۆلیکی؛ سەر بە هیدرۆلیک.

**هیدرولیکی** / hîdrolîkî/: [فرانسوی] صفت. هیدرۆلیکی؛ ئیدرۆلیکی؛ سەر بە هیدرۆلیک.

**هیدرومتر** / hîdrometr ، ـها/: [فرانسوی]/اسم. هیدرۆمیتر؛ ئیدرۆمیتر؛ تراوپێو؛ ئاوپێو: **ئیدرومتر**

**هیدرید** / hîdrîd ، ـها/: [انگلیسی]/اسم. /شیمی/ هیدرید؛ ئیدرید؛ تێکئالاوی کانزا و هیدرۆژن یان کانزا و ناکانزا پێکەوە: **ئیدرید؛ هیدرو**

**هیرودین** / hîrodîn/: [؟]/اسم. هیرۆدین؛ ماکی گیرسێنەری خوێن کە لە لیکی زالوو دەدەڵێ.

**هیراکس** / hîrāks/: [؟] ☜ **موش‌کُله**

**هیروگلیف** / hîyerog(e)lîf, hîrog(i)lîf/: [فرانسوی] ☜ خط هیروگلیف، **خط**

**هیر و ویر** / hîr-o-vîr/: اسم. /گفتاری/ بگرە و بەردە؛ گیر و داو؛ هەرەمەزات؛ گوڕمۆڕە؛ بار و دۆخی جەنجاڵ و شپرز و شێواو.

**هیز** / hîz/: صفت. حیز: ١. بە ئالۆش؛ زەنەک (بۆ

پیاو)؛ حەشەری (بۆ ژن)؛ ئەلۆر؛ شاوەتی ٢. لاکوت؛ چاولەوەڕین؛ نەزەرباز؛ چاوچەڕێن؛ چاوچلێس؛ چاوحیز؛ تۆلاز.

**هیزم / hîzom** ، ـها/:اسم. زەنگ؛ ئیزنگ؛ کەڵەدار؛ بڕەدار؛ هێزم؛ هێزمێ؛ هێزنگ؛ ئێزنگ؛ ئێزینگ؛ کولک؛ کۆلی؛ ئەنجینە؛ ئەنجێنە؛ قلاشکەری؛ قەلاشکەری؛ گەل؛ پێلەوار؛ موور؛ هیمە؛ زەنگەتلیش؛ ئاگردوو؛ خچ‌چیلە؛ چیلی؛ دارێ کە بۆ سووتان تایبەت کراوە.

▣ هیزم تر به کسی فروختن:/تعریض/ خراپە بۆ کەسێک بوون؛ خراوی بۆ کەسێ بوون ‹مگر من چە هیزم تری به تو فروخته بودم کە رفتی از دستم شکایت کردی؟: مەگەر من چ خراپەیەکم لە تۆ بووە، ڕۆشتووی شکاتمت کردووە؟›.

**هیزم‌شکن / hîzomšekan** ، ـها؛ ـان/:اسم. دارکەر؛ داربڕ؛ ئێزنگ کۆکەرەوە؛ کەسێ کە پیشەی شکاندنی چێو یان بڕینەوەی دارە بۆ هێزنگ.

**هیزی / hîzî**/:اسم. حیزی؛ هیزی: ١. دۆخ یان چۆنیەتی حیز بوون ‹مرد به آن هیزی ندیده بودم: پیاوم بەو حیزییە نەدیبوو› ٢. /مجازی/ زیناکاری ‹چرا بترسم؟ مگر دزدی کردم؟ هیزی کردم؟: بۆ بترسم؟ مەگەر دزیم کردووە؟ حیزیم کردووە؟›.

**هیس / hîs**/: صوت. هس؛ هیس؛ هەش؛ هوس؛ وس؛ خوس؛ وست؛ هش؛ هوش؛ پس؛ پست؛ وتەی فەرمان بە بێدەنگ بوون ‹هیس! ساکت باش!: وس! بێدەنگ بە!›.

**هیستری / hîsterî**/: افرانسوی]/اسم. /روان‌شناسی/ هیستری: ١. ڕەنجانی دەروون کە بە تێکچوونی هەست و کاری ئەندامانی هەناو خۆی دەردەخا ٢. ترس و زیچی زۆر.

**هیکل / heykal** ، ـها؛ هیاکل/: [معرب از عبری]/اسم. بەژن؛ پەیکەر؛ هەیکەل؛ قەلافەت؛ نژم؛ لەش؛ کەلەش؛ کەلەخ؛ کەڤال؛ کەلەستە؛ گۆدە؛ گۆڤدە؛ تەن؛ بەچک؛ تووز ‹هیکل قشنگی داشت: هەیکەلێکی جوانی بوو›.

**هیکلدار / heykaldār** ، ـها/: [معرب/ فارسی] صفت. کەلەگەت؛ بە قەوارە؛ ئەستوور؛ گرس؛ هەیکەلی؛ زنتۆل؛ ئابۆنە؛ شاقەڵدار؛ زەگەردوگ؛ زەگزەگە؛ زەگوردە؛ چوارشانە؛ کەڵین؛ زەلام؛ گەپ؛ هرچی‌مندش؛ بە قەلافەتێکی درشت و بەهێزەوە.

**هیمنه / heymane**/: [عربی]/اسم. /ادبی/ هنگ و دینگ؛ جەلال و شکۆ.

**هیمه / hîme** ، ـها/:اسم. /ادبی/ ئیشکەڵ؛ چڕ و چیلکە؛ هێم؛ پووشکە؛ چیلکە؛ هەژهەژاڵ؛ چیلکەوچاڵ؛ چڕ و چێو؛ چۆکلێ؛ پووش و پەلاش؛ چۆلکێ؛ چڵ‌وچێو؛ سووتەمەنی؛ وشکە لق و چێو کە بۆ سووتان دەبێ.

**هیمه‌سوز / hîmesûz** ، ـها/:اسم. شۆمینە؛ شومینە؛ کوورەی نێو دیوار: **شُمینه**

**هین / hîn**/: صوت. هێ؛ هن؛ هەچە؛ هنگ؛ نق- نق؛ دەنگێک بۆ لێخوڕینی چوارپێ.

▣ هین کردن: هێ لێ کردن؛ هن کردن؛ دەکردن ‹خر را هین کرد و برد: هێی لە کەرەکە کرد و بردی›.

**هیولا / hayûlā**/: [معرب از یونانی]/اسم. هەیوولا: ١. /ـها/ جانەوەری وەحشی زل و ناپۆڕ ٢. شتی زۆر گەورە ٣. /ـها/ /کنایی/ مرۆی نالەبار و دڕ ٤. /فلسفه/ هێم؛ ماکی سەرەکی جیهان بەبێ لەبەرچاو گرتنی بیچم و پێکهاتەی.

**هیهات / heyhāt**/: [عربی] شبه‌جمله. ١. پەکوو؛ داخم؛ تەمتەقۆ؛ حەیف و خەسار؛ ئەک؛ ئەکودەک؛ حەیفێ؛ حەیهوو؛ ئەیهوو؛ ئەیهۆهەیهۆ؛ هەیهات؛ ئەی‌هەی؛ تەهۆ؛ دەردۆ؛ مخابن؛ حەیف ‹هیهات! همه چیز از دست رفت: پەکوو! هەموو شتێک لە کیس چوو› ٢. هەرگیز؛ دوورە؛ پێک‌نایە ‹مگر ممکن است زیر بار زور برویم؟ هیهات!: مەگەر دەکرێ مل بۆ زۆر دانەوێنین؟ هەرگیز!›.

# ی

**ی / y/:** *حرف.* ی؛ نیشانەی سی‌ودووهەمین و دوایین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

**ی / ye/:** *اسم.* یێ؛ ناوی سی‌ودووهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی زمانی فارسی.

**ی [1] / 'î/:** *ضمیر.* ـ ی؛ ـ یت؛ ـت؛ جێناوی لکاوی دووهەم کەسی تاک لە زمانی فارسیدا ‹رفتی؛ آمدی؛ خوردی؛ شنیدی؛ می‌شنوی: چووی؛ هاتیت؛ خواردت؛ شنەفتت؛ دەبیسی›.

**ـ ی [2]:** *پسوند.* ١. ـ یێ؛ ـ یێک؛ ـ یێو؛ ـ یە؛ ـەک؛ ناو، نەناس دەکاتەوە ‹مردی؛ کتابی: پیاوێ؛ کتێبێ›: **یای تنکیر؛ یای نکره** ٢. ـ یی؛ ـ ی؛ ـەتی؛ ـ یێتی؛ ـ یەتی؛ ـایەتی؛ لە ناو یا ئاوەڵناو، ناوی چاوگە دروست دەکا ‹مردی؛ دلیری: پیاوەتی؛ کوردایەتی›: **یای مصدری** ٣. ـ یی؛ ـ ی؛ نیشانەی هاوگەری: *الف)* بۆ جێگە ‹جوانرودی؛ روانسری: جوانرۆیی؛ ڕوانسەری› *ب)* بۆ کەس، شت، ڕێباز یان دینێک ‹افلاطونی؛ اسلامی: ئەفلاتوونی؛ ئیسلامی› *ج)* بۆ پیشە یان کارێک ‹بزّازی؛ دکانداری: بەزازی؛ دوکانداری›: **یای نسبت** ٤. ـ ی؛ بە ڕەنگ، شێوە یان دۆخێک ‹رنگی؛ میخی؛ مارپیچی؛ روغنی: ڕەنگی؛ بزماری؛ مارپێچی؛ ڕۆنی› ٥. ـ ی؛ ـ یی؛ ـ ین؛ دروستکراو لە شتێک ‹چوبی؛ آهنی؛ پارچەیی: داری؛ ئاسنی؛ پارچەیی› ٦. ـ ی؛ شوێنی دروستکردن، چاکردنەوە یان فرۆشتن ‹کتابفروشی؛ آهنگری: کتێبفرۆشی؛ ئاسنگەری› ٧. *[گفتاری]* ـ ی؛ فرۆشیاری شتێک ‹نفتی: نەوتی› ٨. ـ ی؛ ـانە؛ بە کەڵک بۆ شت یان کارێک ‹بردنی؛ تابستانی: بردنی؛ هاوینی›: **یای لیاقت** ٩. ـ یێ؛ بۆ ناساندنی ناو (لە ڕستەی فارسیدا پێش لە «کە») ‹مردی کە می‌شناختم: ئەو پیاوەی دەمناسی› ١٠. بووزخۆر و ڕێ‌پێ‌چوو ‹مُردنی: مردنی› ١١. *[گفتاری]* ـ ی؛ ـ ین؛ چۆنیەتی ناو یان ئاوەڵناو لە باری ڕیز یان پلەوە نیشان دەدا ‹اولی؛ آخری: هەوەڵی؛ ئاخری› ١٢. ـ یێ؛ ـ یێک؛ ـ یێو؛ ـ یە؛ بە شوێن ناودا بۆ تاقانە کردنی ‹کتابی؛ پیراهنی: کتێبێ؛ کراسی›: **یای وحدت** ١٣. ـ ی؛ بە هۆی شتێکەوە ‹تلفنی خبر داد: تەلەفوونی هەواڵی دا› ١٤. *[گفتاری]* ـیی؛ ـ ی؛ بە شێوەی ‹بیخودی؛ تنهایی: خۆڕایی؛ تەنیایی› ١٥. ـی؛ لەکاتی؛ کاتی ‹صبحی آمدەبودپیشم: بەیانی هاتبووبۆلام› ١٦. ـی؛ وەبەر بارودۆخێک ‹دریافتی: گرتنی› ١٧. ـ یێ؛ ـ یێک؛ یەک؛ نیشانەی بەراورد ‹دە روزی می‌شد: دە ڕۆژێک دەبوو› ١٨. ـ یێ؛ ـ یێک؛ نیشانەی بایەخ و گرینگی ‹برای خودش کسی بود: بۆ خۆێ کەسی بوو› ١٩. *[گفتاری]* ـلێ؛ ـ ی؛ ـئۆنی؛ وشەی خۆش ویستن ‹بابایی کی برمی‌گردی؟: بابەلی کەی دەگەڕیەوە؟›.

**یـــا / yā/**:/اسـم. یـــا؛ یـــێ؛ نـــاوی عـــەرەبی سیودووهەمین پیتی ئەلفوبێتکەی فارسی.

▣ **یای تنکیر** ☜ **ـ ی[۲]ـ ۱**

**یای لیاقت** ☜ **ـ ی[۲]ـ ۸**

**یای مصدری** ☜ **ـ ی[۲]ـ ۲**

**یای نسبت** ☜ **ـ ی[۲]ـ ۳**

**یای نکره** ☜ **ـ ی[۲]ـ ۱**

**یای وحدت** ☜ **ـ ی[۲]ـ ۱۲**

**یای وصفی** ☜ **ـ ی[۲]ـ ۹**

**یا[۲]**: حرف. یا؛ یان؛ یام؛ نام؛ نـا؛ نیـا؛ ئـان؛ نێـزی؛ یاخۆ؛ نێک؛ نێکه؛ ژا؛ ژای ‹خوب یا بد؛ تو یا او: باش یا خراپ؛ تۆ نام ئەو›.

**یا[۳]**: [عربی] *صوت*. یا؛ ئەی؛ وشەی بانگ‌کردن ‹یا رب نظر تو برنگـردد: ئـەی خوایـە تۆمـان لـێ عـاجز نەبی›.

**یاالله / yā'allāh/**: [عربی] *دعا*. یالـلا: ١. یائەلـلا؛ وشەی پێشەکی بۆ چوونە ژوور ‹یاالله گفت و آمد تو: یاللای گوت و هاتە ژوورەوە› ٢. وتـەی بـەخێر هێنان و مەرحەبا ‹یاالله، خوش آمدید: یاللا، بـەخێر بێن› ٣. وتەیەک بۆ دنـەدان ‹یـاالله! تکـان بخـور: یاللا! بجوولەوە›.

**یائسگی / ya'esegî/**: [عربی / فارسی]/*اسم*. بێواری؛ ئاوەسۆیی؛ لە زان‌کەوتوویی؛ ناو؛ ڕەوتی بڕانەوەی پۆن و بێ‌نوێژی مانگانەی ژن لە نێـوان تەمـەنی ٤٥ تا ٥٠ سالەییدا.

**یائسه / yā'ese** ، ـها/: [عربی] *صفت*. ئاوەسۆ؛ بێـوار؛ لـە زەگ وەسـتاو؛ عوزرنەشـۆر ‹زن یائسـه: ژنی ئاوەسو›.

▣ **یائسه شدن**: لە بەر چوونەوە؛ لە زگەو چـوون؛ لە زکـوزا وەستان؛ لە زک وێسانەوە؛ لە عـوزر چوونەوە/ وەستان؛ ناهومێد بوونی مێوینـە لـە زان.

**یائو / yā'o/** ☜ **یاو**

**ـ یاب / yāb/**: *پیواژه*. ـــ دۆز؛ ـ ئـەوەیۆز؛ وەدۆز؛ دۆزەر؛ پەیداکـەر ‹آهـن‌یـاب؛ کاریـاب: ئاسـن‌دۆز؛ کاردۆز›.

**یابو / yābû** ، ـهـا/:/*اسـم*. یـابوو؛ پـالانی؛ بـارگیر؛ بارگیـل؛ بـارگین؛ گۆلـەبارگین؛ قولـە؛ کورتـە؛ ئەسپی نانەجیبی بارکێشان.

▣ **یابو برداشتن**: خۆ گوم‌کردن ‹همینکه دستش به پول رسید، یابو برش داشـت: هـەر ئەوەنـدە پـارەی دەس‌کەوت، خـۆی گـوم کـرد›.

**ـــ یـابی / yābî/**: *پیـواژه*. ـــ دۆزی؛ دۆزینـــەوە ‹کاریابی: کاردۆزی›.

**یاتاقان / yātāqān** ، ـهـا/: [ترکـی]/*اسـم*. یاتاقـان؛ یاتاق؛ کەرستەیەکی نێـو موتـوری ماشـین کـە میلە یان تەوەرەیەکی لە سـەر هەڵدەسـووڕێ: **یاطاقان**

▣ **یاتاقان ساچمه‌ای** ☜ **کاسه ساچمه**

**یاخته / yāxte** ، ـها/:/*اسـم*. *[زیسـت‌شناسـی]* خـان؛ خانـــە؛ خانـــک؛ خـــانۆک؛ چـــاوە؛ ســـیللوول؛ تۆپەڵەیەکی ناسکی پرۆتـۆپلاسمی کـە یەکـەی پێکهێنەری شانەگەلی گیایی و گیانەوەریە.

**یاخته‌ای / yāxte'î/**: *صفت*. *[زیست‌شناسی]* خـانی؛ خانکی؛ خانۆکی؛ چاوەیی؛ سـیللوولی؛ سـەر بـە سیللول.

**یاخته‌شناسی / yāxtešenāsî/**:/*اسم*. *[زیست‌شناسی]* چاوەناسی؛ لقێک لە زانستی ژیناسی کە لە سەر خانە و سەرچاوە و کارکردیان دەکۆڵێتەوە.

**یاد / yād/**:/*اسم*. یاد؛ یاو؛ یای؛ یاتی: ١. بیر؛ ویر؛ هۆش؛ هوور؛ هویر؛ ورینە؛ چێل؛ گاودۆڵ؛ هیزر؛ فکـر؛ بێـری ‹یـادت نـرود: لـە بـیرت نـەچێ› ٢. بیراهی؛ بیرەوەری ‹یادش به خیر: یادی بـەخێر بێ›.

▣ **به یاد کسی/ چیزی**: لە بەر کەسێ/ شتێک؛ بۆ خوشحاڵ کردن یان بیرئانینی کەسێ.

▣ **یاد آمدن**: بیر هاتنەوە؛ کەوتنـەوە بـیر/ یـاد؛ کەفتنە بیر؛ ئامایوە ویر.

**یاد آوردن** ☜ **به یاد آوردن**

**یاد افتادن**: کەوتنەوە بیر؛ ئامایوە هۆش/ ویر.

**یاد بودن**: لە بیر بوون؛ لە هۆش بوون ‹یادم است اوّل صبح بود: لە بیرمە سەر لە بەیانی بوو›.

**یاد دادن**: فێرکردن؛ شێرکرن؛ عەلماندن؛ مسنایینە؛ مستنایش؛ مسنایش؛ مسنەی؛ مسنای؛ هەڤیساندن؛ هەرساندن؛ عاملاندن؛ هوورین کردن؛ هێ کرن؛ هووکارەکردن ‹بە سگ یاد دادە بود در را باز کند: سەگەکەی فێر کردبوو دەرگاکە بکاتەوە›.

**یاد داشتن**: لە بیر بوون؛ لە هۆش بوون ‹یاد داری کە وقت آمدنت/ همە خندان بُدند و تو گریان؟: لە بیرتە ئەو کاتە کە هاتیە دنیا/ هەموو پێدەکەنین و تۆ دەگریای؟›.

**یاد رفتن**: لە بیر چوون؛ لە هۆش چوون ‹یادم رفت نامت را بنویسم: لە بیرم چوو ناوت بنووسم›.

**یادکردن**: یاد لێ کردن؛ بەیادکردن؛ بیرکردن؛ یاد کردنەوە؛ وەبیر هێنانەوە؛ دودکردن؛ گێڕاندنەوەی ناو، بیرەوەری یان تایبەتمەندیەک و بوونە هۆی بووژانەوە و سەرهەڵدانی زانیاری لەو بارەوە ‹دوستان بە کە از او یاد کنند/ دل بی دوست دلی غمگین است: ڕەفیقان خۆشە یادێکی لێ بکەن/ کەسێ دۆستی نەبوو دلی داماوە›.

**یاد کسی را کردن**: تاسەی کەسێ کردن؛ یاد کەسێ کردن؛ وەبیر هێنانەوەی یادی کەسێ؛ بیری کەسێک کردن/ کردنەوە.

**یاد کسی را گرامی داشتن**: (بە ڕێزەوە) یادی کەسێک کردن؛ ناوی کەسێ بەرز ڕاگرتن ‹یاد شاعر نامی نالی را گرامی داشتند: لە شاعیری بەناوبانگ نالی (بە ڕێزەوە) یادیان کرد›.

**یاد کسی رفتن** ☜ **از یاد کسی رفتن**

**یاد گرفتن**: فێر بوون؛ هێ بوون؛ هین بوون؛ هووین بوون؛ هووکارە بوون؛ هۆژان؛ هۆژین؛ ڕاهاتن؛ هەڤۆتن؛ هاڤۆتن؛ هەوسین؛ واگرتن؛ مسەی؛ مسای؛ هەڤیسین؛ چارشانین؛ موسنایا؛ موسایش؛ موسنایش ‹در شش ماه زبان کُردی را یاد گرفت: لە شەش مانگدا فێری زمانی کوردی بوو›.

**از یاد بردن**: لە بیر بردنەوە؛ فەرامۆش کردن؛ جە ویر بەردەیەوە ‹پس از مدتی همەی آن سختیها را از یاد برد: پاش ماوەیەک هەموو ئەو کوێرەوەریانەی لە بیر بردەوە›.

**از یاد رفتن**: لە بیر چوونەوە؛ لە بیرەوە چوون؛ فەراموش بوون؛ ویروەشیەی ‹پس از مدتی، آن ماجرا از یاد رفت: پاش ماوەیەک، ئەو ڕووداوە لە بیر چووەوە›.

**از یاد کسی رفتن**: لە بیر کەسێک چوونەوە ‹بە همین زودی از یادت رفت؟: ئەوەندە زوو لە بیرت چووەوە؟›: **یاد کسی رفتن**

**از یاد کسی/ چیزی غافل شدن**: کەسێ/ شتێ لەبیرکردن ‹پاک از یاد او غافل شدیم: تەواو لە بیرمان کرد›.

**بە یاد آمدن**: هاتنەوە بیر؛ وەبیر هاتنەوە؛ بە یاد هاتنەوە؛ وەبیر کەوتنەوە؛ ئامایوە ویر ‹آخر بە یادم آمد کە او را کجا دیدە است: ئاخری هاتەوە بیرم کە لە کوێ دیتوویە›.

**بە یاد آوردن**: هێنانەوە بیر؛ وەبیر هێنانەوە؛ بە یاد هێنانەوە؛ وە یاد هێنانەوە؛ ئاردەیوە ویر ‹حتی نامش را هم بە یاد آورد: تەنانەت ناویشی هێنایەوە بیر›: **یاد آوردن**

**بە یاد کسی/ چیزی افتادن**: کەوتنەوە بیری شتێک/ کەسێک؛ بیر هەڵگەڕانەوە بۆ کەسێ/ شتێک ‹بە یاد همسالان دورەی دبستانش افتاد: کەوتەوە بیری هاوتەمەنانی سەردەمی سەرەتایی›.

**بە یاد کسی / چیزی بودن**: لە یادی کەسێک / شتێکدا بوون؛ لە بیری کەسێ/ شتێکدا بوون ‹هنوز پس از سالها بە یاد او بود: ئێستەش پاش ئەو هەموو ساڵە، هەر لە بیری ئەودا بوو›.

**بە یاد نداشتن**: لە بیر نەبوون: ١. لە بیر نەمان/ چوون؛ فەامۆشکردن؛ هۆش نەبیەی؛ لە بیرکردن ‹بە یاد ندارد آن را کجا گذاشتە است:

له بیری نه‌ده‌بوو له کوێ داینـاوه› ۲. بـیره‌وه‌ری پێشووتر نه‌بوون ‹هیچکس چنان سرمایی را به یاد ندارد: که‌س سه‌رمای وای له بیر نییه›.

یادآور / yādāvar/: صفت. بیرهێنه‌ره‌وه؛ وه‌بیرهێنه‌ر ‹این شهر برایم یادآور خاطرات خیلی خوبی است: ئه‌م شاره بیرهێنه‌ره‌وه‌ی بیره‌وه‌ری زۆر خۆشه بۆم›.

◘ یادآور شدن: وه بیر هێنانه‌وه؛ خستنه‌وه بیر ‹وظیفه‌اش را به او یادآور شد: ئه‌رکی سه‌رشانی خسته‌وه بیری›.

یادآوری / yādāvarî/: اسم. ویره؛ بیرهێنانه‌وه؛ وه‌بیرهێنان؛ کار یا ڕه‌وتی بیر خستنه‌وه؛ به یاد هێنانه‌وه ‹یادآوری آن روزها برایش لذتبخش بود: له بیری ئه‌و ڕۆژانه که‌یفی ده‌کرد›.

یادبود / yādbûd، ـها/: اسم. ۱. بیرئانین؛ ئه‌وه‌ی که ده‌بێته هۆی وه‌بیر هێنانی که‌سێک / شتێک ۲. بیره‌وه‌ری.

یادداشت / yād.dāst، ـها/: اسم. یاداشت؛ یادداشت؛ یاداش: ۱. نیشه؛ نووسینێکی کوڵ و کۆتا بۆ له بیر نه‌چوون یان بیر خستنه‌وه ‹در این یادداشت، کارهای فردا را برایت را نوشته‌ام: له‌م یاداشته‌دا، کاره‌کانی سبه‌ینێم بۆت نووسیوه› ۲. لاپه‌ڕه‌یه‌ک به نووسراوه‌یه‌که‌ی وه‌هاوه ‹نمی‌دانم کِی این یادداشت به دست برسد: نازانم که‌ی ئه‌م یاداشته‌ت بگاته ده‌ست› ۳. کاری نووسینی شتی وا ‹با دقت همه چیز را یادداشت کن!: به وردی هه‌موو شتێ بنووسه‌وه!› ٤. ڕا و ڕاڤه‌یه‌کی کورت له خواره‌وه‌ی ده‌ق و په‌راوێزی لاپه‌ڕه‌دا ٥. نامه‌یه‌کی کورت بۆ هه‌واڵدانێک ٦. بیره‌وه‌ریگه‌لی که‌سێک به شێوه‌ی نووسراوه‌ی کورت ‹یادداشتهای سفر اروپا: یاداشتی سه‌فه‌ری ئورووپا› ۷. نامه‌ی سیاسی ده‌وڵه‌تێک بۆ ده‌وڵه‌تێکی تر.

◘ یادداشت کردن: یاداشت‌کردن؛ بۆ له بیر مان، شتێک به‌کورتی نووسین و هه‌ڵگرتن ‹حرفهای او را یادداشت کرد: قسه‌کانی یاداشت کرد›.

یادسپاری / yādsepārî/: اسم. کار و ڕه‌وتی له‌به‌ر کردن؛ به بیر سپاردن؛ سپاردنه هزر. هه‌روه‌ها: **یادسپار**

یادگار / yād(e)gār، ـها/: اسم. یادگار: ۱. ئه‌وه‌ی له که‌س یان ڕووداوێک ده‌مێنێته‌وه و بیرهێنه‌ره‌وه‌یه‌تی ‹این کتاب یادگار پدرم است: ئه‌م کتێبه یادگاری بابمه› ۲. شوێنه‌وار؛ شۆنه‌وار؛ شۆنه‌ما؛ ئاسه‌وار.

◘ به یادگار ماندن: لێ به‌جێ مان؛ لێ مانه‌وه؛ به یادگار مانه‌وه ‹آثار باارزش بسیاری از استاد هه‌ژار به یادگار مانده است: به‌رهه‌می به‌نرخی زۆر له مامۆستا هه‌ژار به جێ ماوه›.

یادگاری / yād(e)gārî، ـها/: اسم. یادگاری؛ بیره‌وه‌ری؛ بیرئانی: ۱. شتێ که به که‌سێک ده‌درێ بۆ ئه‌وه‌ی هه‌رگا چاوی پێ‌که‌وت، ئه‌و که‌سه بێته‌وه بیری ‹این کتاب را از من یادگاری داشته باش!: ئه‌م کتێبه با یادگاری من بێ له لات!› ۲. نووسراوه‌یه‌ک به سه‌ر دار و دیوار و... دا بۆ بیر هاتنه‌وه.

یادگیری / yādgîrî/: اسم. ۱. هه‌وس؛ هه‌ڤۆت؛ کار و ڕه‌وتی ڕاهاتن؛ هه‌ڤۆتن؛ فێر بوون؛ مسه‌ی؛ مسای ۲. *[روان‌شناسی]* گۆڕانکاریه‌کی وا که به هۆی ئه‌زموون یان فێر بوون، له کار و کرده‌وه‌ی گیاندارا‌دا به‌دی دێ.

یادمان / yadmān، ـها/: اسم. بیرئانین؛ یادمان؛ ئه‌وه‌ی که بۆ ڕێزنان له که‌س یان ڕووداوێک دروست کراوه.

یادنامه / yādnāme، ـها/: اسم. یادنامه؛ ده‌فته‌ری بیره‌وه‌ری؛ کتێبێ که بۆ بیره‌وری و یادی که‌س یان ڕووداوێک، به تایبه‌ت بۆ ڕێز لێنانی ده‌نووسرێ.

یادواره / yādvāre، ـها/: اسم. بیرئانین؛ ڕێوڕه‌سمێک بۆ ڕێزگرتن له که‌س یان

ڕووداوێک.

**یار** [1] / yār ، ـان/: *اسم.* یار؛ سیار؛ یۆو: ١. گــراوی؛ دلبەر؛ دۆس؛ دۆسە؛ ئەوەی دڵی لـە لا دانرابــێ ٢. *[ادبی]* هەواڵ؛ ئاواڵ؛ هەڤاڵ؛ هاڤـاڵ؛ ڕەفیـق؛ دۆس؛ دۆست؛ ئاریکـار؛ یاریکـار؛ یـاوەر؛ هـاوڕا؛ هاوڕێ؛ هاودەم؛ هامدەم ‹خدا یار و یـاور شـما بـاد: خواتان یار و پشتیوان بێ› ٣. یاریکەر؛ هەر کام لە کایەکـەرانی تیمێـک ٤. هاوکـار ٥. هــاوڕێ ٦. یاوەر؛ یاریدەر.

▣ **یار جانی:** *[ادبی]* هەواڵـی زۆر خۆشەویسـت و ئـازیز؛ دۆسـتی گیـان‌گیـانی/ گیـانی‌گیـانی؛ هەواڵی گیانی؛ یاری گیانی.

**یار غار:** *[کنایی]* یاری غار؛ هەواڵی زۆر نزیک.

ـ **یـار** [2]: *پیوأژه.* ـــ یـار: ١. یارمەتیـدەر ‹دستیار: دەستیار› ٢. ئاریکار؛ هاوکار ‹پزشکیار: بژیشـکیار› ٣. ـــ مـەن؛ ـ مەنـد؛ ـ دار؛ دارنـدە ‹هوشـیار: هۆشیار›.

**یارا** / yārā/: *اسم. [ادبی]* هێـز؛ قـەوەت؛ قـووەت؛ تاقەت؛ وێران؛ یـارا؛ کومسـە؛ توانا؛ زۆخ؛ زووخ؛ تین؛ هازی؛ هەرەنگ؛ شنگ؛ بـڕ؛ گـوڕ؛ هەڤـل؛ حێل؛ هێل؛ پرزە؛ خوڕ؛ هاز؛ توانایی؛ تەشە؛ پل و پۆ ‹مرا یارای این کار نیست: من هێـزی ئـەم کـارەم نیە›.

**یارانـە** / yārāne ، ـهـا/: *اسـم.* سوبسـید؛ یارانـە؛ کۆمەکی مالـی دەوڵـەت بـە مەبەسـتی دابـین کردن و ڕاگرتنی نرخی شت‌ومەکی گشـتی بـە هەرزان و بەرگری لە گران بوونیان.

**یارد** / yārd/: [انگلیسی]*اسم.* یارد؛ یەکەی پێوانی درێژایی لە ولاتە ئینگلسی زمانەکانـدا بەرامبـەر بە ٣ فووت، ٣٦ اینچ، یان ٩١,٤٤ سانتی‌میتر.

**یاردانقلی** / yārdānqolî/: [ترکی]*اسـم. [تعـریض]* زەبــەلاح؛ دەس و پاقــەوی؛ زلحــۆرت؛ زلحــۆ؛ زرەمێر؛ زلک؛ تەژە؛ پیاوی لە بنەماڵەی خـواری بەتایبەت نەفامی زل و ملقەوی.

**یارستن** / yārastan/: *مصـدر. لازم. [ادبـی]* وێـران؛ وێرین؛ زات بوون؛ یارەی؛ یـارای؛ هێـورین؛ بـە خۆدا پەرمیان؛ دەرەقەت هاتن؛ دە خۆڕا دیـتن؛ چارکردن.

■ مصدر منفی: **نیارستن** (نەوێران)

**یارکشی** / yārkešî/ ☜ **یارگیری**

**یــارگیری** / yārgîrî ، ـهــا/: *اســم.* یــاربژێری؛ یــارگیری؛ کــار و ڕەوتی هەڵــبژاردنی یــار بــۆ دەستە یان تیمی خۆ: **یارکشی**

**یــارو** / yārû/: *ضــمیر. [گفتــاری]* کــابرا؛ کــاورا؛ کاوراکە؛ یارۆ؛ فلانی؛ لۆ؛ جبـۆ؛ جـەبۆ؛ ئەوەکـە؛ فلان؛ بێل؛ فران؛ گـۆیین؛ گـۆرین؛ ئـەو کەسـە قسەی لێ‌دەکرێ، بەتایبەت بۆ بـە سـووکی نـاو لێ بردن ‹یارو خیال کرده بود بی‌حساب و کتاب است!: کابرا وەی دەزانی هەرچی‌پەرچیە!›.

**یار و یاور** / yār-o-yāvar/: *اسم.* یار و یاوەر؛ یـار و هاودەنگ؛ دۆست و برادەر.

**یــاری** / yārî ، ـهــا/: *اسـم.* یارمــەتی؛ یاریــدە؛ هەڤــاری؛ هــاری؛ کۆمــەک؛ ئاڤـیاری؛ وەهیــد: ١. باربوو؛ تـەوجی؛ هاڤـل؛ ئاریکـاری؛ یـاردەی؛ کارێک بـۆ قـازانجی کەسـی‌تـر ‹بـە یـاری مـردم شتافتند: چوونـە باربووی خەڵـکەوە› ٢. هاوکـاری لەگەڵ کەسی‌تردا بۆ گەیشتن بە ئامانجێکی ‹او را در خریدن خانه یاری کـرد: بۆ کڕینی مـاڵ یارمـەتی دا›.

**یاریگر** / yārîgar ، ـان/: *صفت.* یاریـدەر؛ ئاریکـار؛ هاریکـار؛ یارمەتیـدەر؛ یارمـەتی‌کـەر؛ یاریکـار؛ یاردەدەر. هەروەها: **یاریگری**

**یـازده** [1] / yāzdah/: *اسم.* یـازدە؛ یـانزە؛ یـانزدە؛ یانگزە؛ یەوەندە؛ یەوندەس؛ یەوەندەس؛ ژمارەی سەرەکی بە دوای دە و پێش لە دوازدە.

**یازده** [2]: *صفت.* یازدە: ١. یـانزدە؛ یـانگزە؛ یـەکێ زۆرتر لە دە دانە ٢. یازدەهەم.

**یــازدهم** / yāzdahom/: *صــفت.* یازدەهـــەم؛ یانزەهەم؛ یازدەهۆم؛ یازدەیەم؛ لە ڕزن و جێگای دوای دەیەمدا.

**یازدهمی** / yāzdahomî/: ضمیر. یازدەهەمی؛ یازدەیەمی؛ ئەوەی کە لە پلەی یازدەهەمدایە.

**یازدهمین** / yāzdahomîn/: *صفت.* یازدەمین؛ یازدەهەمین؛ یازدەمین؛ یانزەمین؛ یەوەندەمن؛ یەوەندەسن؛ بە ڕزن، جێگە یان پلەی یازدەوە.

**یازیدن** / yāzîdan/: *مصدر. متعدی. لازم. [ادبی]* // **یازیدی**: ڕاتکێشا؛ **می‌یازی**: ڕادەکێشی؛ **بیاز**: ڕاکێشە // ◻ *متعدی.* ١. ڕاکێشان؛ داکێشان؛ درێژ کردنەوە؛ درێژەوکردن ◻ *لازم.* ٢. ڕاکێشران؛ کێشران؛ داکێشیان؛ درێژ بوونەوە ٣. دەست/ دەس بردن؛ گرتن ٤. پەرەنگین؛ ڕاهاتن ٥. داهاتن؛ چەمینەوە؛ کۆمینەوە؛ کۆمیایرە؛ ئەرەنامیەی؛ نەوینەوە ٦. ڕوو هێنان؛ ڕوو لێنان؛ ڕوو لێ‌خستن ٧. ڕۆیشتن؛ چوون؛ لوەی؛ ڕەوان بوون.

■ صفت فاعلی: **یازنده** (ڕاکێشەر) / صفت مفعولی: **یازیده** (ڕاکێشراو) / مصدر منفی: **نیازیدن** (ڕانەکێشان)

**یاس** / yās ، ـها:/ *اسم.* یاس؛ دارسووزن؛ یاسەزەرد؛ دارچکێکی لق هەڵچوو، بە گەڵای خڕی نووک‌تیژەوە کە گوڵێکی زەرد یان سپی بۆنخۆش دەردەکا.

▣ **یاس بنفش** ☜ **یاس خوشه‌ای**

**یاس خوشه‌ای**: یاسی بەنەوش؛ یاس کەووگ؛ پوورگوڵ؛ جۆرێک یاس بە هێشووە گوڵی سپی یان بنەوشەوە: **یاس بنفش؛ یاس شیروانی**

**یاس شیروانی** ☜ **یاس خوشه‌ای**

**یأس** / ya's ، ـها:/ [عربی] *اسم.* ناهومێدی؛ بێ‌هیوایی؛ بێ‌هەویایی؛ ناهمێیی.

**یأس‌آمیز** / ya'sāmîz, -'āmîz/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ناهومێدانە؛ ناهمێدانە؛ هامێیانە؛ بە ناهومێدیەوە.

**یأس‌آور** / ya'sāvar, -'āvar/: [عربی/ فارسی] *صفت.* ناهومێدکەر؛ ناهمێکەر.

**یاسا** / yāsā/: [مغولی] *اسم.* یاسا: ١. قانوون؛ زاکوون؛ بنەما؛ پێودان؛ ڕێ و شوێن ٢. *[قدیمی]* دەستووریٚ کە چەنگیز وەکوو قانوونێکی زۆر سەخت، بۆ لەشکری خۆی دانابوو.

**یاسمن** / yāsaman ، ـها:/ *اسم.* یاسەمەن؛ ئاسمین؛ یاسەمین؛ یاسەمەنە؛ یاسمەنە؛ سەمەن؛ مەران؛ دارچکێکی هەڵچوو کە لە سەرە بەهاردا گوڵی سپی یان بنەوشی زۆر بۆنخۆش دەکا، لقی دەکەنە دارە جگەرە.

**یاسین** / yāsîn ، ـها:/ [عربی] *اسم.* یاسین؛ ئاسین؛ ناوی سوورەی ٣٦ی قورئان کە ١٨١ ئایەتە و لە شاری مەکەدا هاتووە.

▣ **یاسین به گوش خر خواندن**: بلوێر بۆگا لێدان؛ یاسین بۆ کەر خوێندن؛ بۆ کەڕ لێدان و بۆ کوێر هەڵپەڕین؛ قسە (بەتایبەت پەند) بۆ ناحاڵی و گوێ‌نەبیس گوتن.

**یاطاقان** / yātāqān/: [ترکی] ☜ **یاتاقان**

**یاغی** / yāqî ، ـها؛ ـان:/ [ترکی] *صفت.* چەڵەک؛ شیوارە؛ سەربزێو؛ ئەشقی؛ سەرەڕۆ؛ بزۆز؛ جەبە؛ یاغی؛ یاخی؛ سەرکێش؛ کەنهەش؛ مکوڕ؛ لامۆفک؛ لامۆفەک؛ خەتمی؛ قاندڕ؛ پەت‌پسێن؛ بەزاج؛ لامۆخک؛ ختمی؛ هەج؛ دانەساخ؛ گونڕەش؛ نافەرمان.

▣ **یاغی شدن**: یاخی/ یاغی بوون؛ ئەشقی بوون؛ وەتانایش.

**یاغیگری** / yāqîgarî ، ـها:/ [ترکی/ فارسی] *اسم.* سەربزێوی؛ یاخیەتی؛ ئەشقیەتی؛ نافەرمانی.

**یافتن** / yāftan/: *مصدر. متعدی. لازم. [ادبی]* // **یافتی**: دۆزیتەوە؛ **می‌یابی**: دەدۆزیەوە؛ **بیاب**: بدۆزەوە// ◻ *متعدی.* ١. دۆزینەوە؛ پەیدا کردن؛ دیتنەوە؛ بە سەر گرتنەوە؛ ئەوەیۆسەی؛ یۆستەیوە؛ ئێستەیوە؛ ئەوەدیەی؛ دیەیوە؛ لە شوێنی شتێک خەبەردار بوون ‹کتابش را یافت: کتێبەکەی دۆزیەوە› ٢. دۆزینەوە؛ دەس‌خستن؛ بیناندنەوە؛ یۆستەیوە؛ ئێستەیوە؛ دیەیوە؛ بە دەست هێنانی شتی ون یان نادیار ‹کار یافتن:

کار دۆزینەوە› ٣. دۆزینەوە؛ ڤەدیتن؛ پێزانین و بە دەس هێنانی وەڵامی پرسیار لە ڕێگای پرسین، لێکۆڵینەوە و تێرامانەوە ‹پاسخ سوآل را یافتن: وەڵامی پرسیار دۆزینەوە› □لازم. ٤. وەک هاوکرد: بە بار و دۆخێکی تر دەرهاتن ‹تغییر یافتن؛ پایان یافتن: گۆڕان؛ تەواو بوون›. هەروەها: **یافتنی**

■ صفت فاعلی: **یابنده** (دۆزەرەوە) / صفت مفعولی: **یافته** (دۆزراوە) / مصدر منفی: **نیافتن** (نەدۆزینەوە)

**یافته** / yāfte ، ـها:/اسم. دۆزراوە ‹یافته‌های اینشتین خبر از تحولی بزرگ در علم فیزیک می‌داد: دۆزراوەکانی ئەنشتەین هەواڵی لە گۆڕانکاریەکی مەزن لە زانستی فیزیک دەدا›.

**یاقوت** / yāqût/: [معرب از فارسی]/اسم. یاقووت؛ یاکووت؛ ئاقووت؛ پاگەنە؛ پاگەند؛ پاخەنە؛ جۆرێک بەردی سووری جوان و بەنرخە لە گۆهەرسازیدا بەکار دەڕوا.

**یاقوت‌فام** / yāqûtfām/: [معرب/ فارسی] صفت. یاقووتی؛ یاقووت‌ڕەنگ؛ یاقووت‌واش؛ بەڕەنگی یاقووت.

**یاقوتی**[1] / yāqûtî/: [معرب]/اسم. یاقووتی: ١. زووڕەسە؛ جۆرێک ترێی سووری دەنک وردە زوو پێدەگا ٢. ڕەنگی سووری تۆخ و بریقەدار وەک یاقووت.

**یاقوتی**[2]: صفت. یاقووتی؛ بە ڕەنگی سووری تۆخ و بریقەدار.

**یاک** / yāk/: [؟] ☜ **غژگاو**

**یاکریم** / yākarîm ، ـها/: [عربی]/اسم. فاتک؛ فات‌فاتک؛ فاتنک؛ کۆترەباریکە؛ کۆترەبەرجیلە؛ کۆترەبرجیلە؛ کۆترەبەچیلە؛ کۆترەبنجیلە؛ یاکەریم؛ ترێنە؛ تفتیلک؛ ترێنکە؛ توویل؛ کۆترێکی کلک‌درێژی چاوسوور، بە سەر پشتی قاوەیی و سەر و سینگی کاڵترەوە، بڕێکیان تۆقێکی ڕەشی لە دەور ملە.

**یاکوت** / yākût/:اسم. ١. هۆزێکی زەردپێستی دانیشتووی قەراخی زەریاچەی بایکاڵ لە سیبری ٢. ـها/ هەر یەکە لە کەسانی ئەو هۆزە ٣. زمانی ئەو هۆزە کە لە زمانە مەغولیەکانە.

**یال** / yāl ، ـها/:اسم. یال؛ یال: ١. بژی؛ ژە؛ زیی؛ دەهەف؛ پروو؛ بژ؛ پژ؛ تیسکی سەر مل و سینگی بڕێ ئاژەڵ (وەک ئەسپ و شێر) ٢. [کردی] دەمی چیا؛ سەرملە؛ گەڤری؛ خەتی سەر کێو ٣. هەرجۆرە هەڵهاتوویی یان دەرپەڕیوییێکی ناسک و تیژ.

**یالقوز** / yālqûz ، ـها/: [ترکی] صفت. *[تعریض، گفتاری]* زگورد؛ ڕەبەن؛ هەوان: ١. سەڵت؛ سەڵت و سپاتە؛ بێ‌هاوسەر ٢. تەنیا؛ بێکەس.

**یال و کوپال** / yāl-o-kûpāl/:اسم. شان و باهۆ؛ سەر و مل؛ شان و مل؛ شان و پیل (بەتایبەت کاتێ کە درشت و بەقەوەت بێ).

**یانکی** / yānkî ، ـها؛ ـان/: [انگلیسی]/اسم. یانکی؛ کورتە ناوێک بۆ سووکایەتی بە ئەمریکاییان (بەتایبەت چەکداریان).

**یاو** / yāv ، ـها/:اسم. یاو: ١. دەستەیەک لە خەڵکی بانتۆزمانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا کە زۆربەیان موسوڵمانن ٢. یائۆ؛ هۆزی گوندنشین و زۆر پەرژ و بڵاوی کوێستانی، بە فەرهەنگ و کەلەپووری جۆراوجۆرەوە کە لە چین، هیندوچین و باشووری ڕۆژاراوی ئاسیادا نیشتەجێن * **یائو**

**یاور** / yāvar ، ـها؛ ـان/: صفت. *[ادبی]* یاریدەر؛ یاریدە؛ یاریدەدەر؛ یاردەدەر؛ ئاریکار؛ یاریکار؛ یاریکەر؛ یاوەر؛ یارمەتیدەر؛ ئامیار؛ هەواڵ؛ هاوباڵ؛ هنە.

**یاوری** / yāvarî ، ـها/:اسم. *[ادبی]* ئاریکاری؛ یاریدەری؛ یاوەری؛ یاریکاری؛ پشتیوانی؛ هاریکاری.

**یاوه** / yāve ، ـها/:اسم. بێ‌مانا؛ فلتەفلت؛ فلتە؛ شیتە؛ ڤرت؛ پووچ؛ بن‌شڕ؛ حەلەق‌مەلەق؛ کۆڵە؛ هەرزەویژە؛ فشقیات؛ گەف؛ کەلپەترە؛ بێخۆ؛

پووچەڵ؛ بن‌شڕ؛ هیچ و پووچ؛ لەوچ؛ گەزاف؛ پشم؛ قۆڕیات؛ پڕ و پووچ؛ یافا؛ هەڵیتوپەڵیت؛ وڕ؛ کاوبا؛ ڤین؛ قسە و باسی بێ‌مانا و بێ‌کاکڵ و ناڕاست.

◘ یاوه گفتن: فلتاندن؛ وەڕاوەکردن؛ ورینەکردن؛ قسەی بێ‌مانا و بێخۆکردن.

**یاوه**٢: *صفت.* پووچ؛ پووچەڵ؛ هیچ و پووچ؛ پڕ و پووچ؛ بەلاش؛ حەلەق‌مەلەق؛ کۆڵە؛ گەف؛ بێ‌مانا؛ هەڵیت‌وپەڵیت؛ تایبەتمەندی قسەیەک کە هیچی لەبارەدا نەبێ.

**یاوه**٣: *قید.* گەوجانە؛ لاژەلاژ؛ گێژەگێژ؛ شێوە قسەکردنی نەپوخت بێ‌کاکڵ ‹یاوه می‌گوید: گەوجانە دەڕیسێ›.

**یاوه‌سرایی** / yāvesarayî، ـها/: *اسم.* هەرزەگۆیی؛ لەوچەلەوچ؛ فلتەفلت؛ شرم‌بڕم؛ کۆڵەویژی؛ کار و ڕەوتی فلتاندن؛ ڕنگان؛ ڕنگانەوە؛ قسەی بێ‌مانا و پووچەڵ کردن: **یاوه‌گویی**. هەروەها: **یاوه‌سرا**

**یاوه‌گو** / yāvegû/: *صفت.* گەفۆک؛ دەم‌گەوج؛ هەرزەویژ؛ کۆڵەویژ؛ چەنەوەر؛ چەنەباز؛ هەلەوەڕ؛ بێ‌تام‌بێژ.

**یاوه‌گویی** / yāvegûyî/ ☜ **یاوه‌سرایی**

**یبس** / yobs/: [عربی] *صفت.* *[نامتداول]* ١. قەبز؛ بەسراو؛ تووشیاری زگ‌وەستاوی ٢. *[گفتاری]* وشک؛ بە خۆ و خدەی سارد و سڕ و ڕەسمیەوە ‹پدرش خیلی یبس است، اصلاً با کسی دوست نمی‌شود: بابی زۆر وشکە، لەگەڵ کەسدا دۆستی ناکا›.

**یبوست** / yobûsat, yubûsat/: [عربی] *اسم.* پندری؛ پنری؛ گرفت؛ قەبزی؛ ڕوودڵ؛ زک‌گیری؛ نەخۆشیەکی درێژخایەنە کە بە هۆی کەم خواردنەوەی ئاو یان تێکچوونی دەماری ڕیخۆڵەوە بەدی دێ و نەخۆش درەنگاودرەنگ و بە ئەستەم زگی کار دەکا.

**ـ یت** / yat/: [عربی] *پسوند.* ـایەتی؛ ـ یەتی؛ ـەتی؛ ـ یی؛ لە بار و دۆخێکدا بوون ‹انسانیت؛ خریت: مرۆڤایەتی؛ کەریەتی›.

**یتیم** / yatîm، ـها؛ ـان؛ ایتام/: [عربی] *صفت.* هەتیو؛ هێتم؛ هەتیم؛ ئێتیم؛ هێتیو؛ هەتی؛ یەتیم؛ سێوی؛ وڵ؛ یەسیر (دایک مردوو)؛ بێ‌باب و دایک (بەتایبەت بێ‌باوک).

◘ یتیم شدن: هەتیو/ هەتیم بوون؛ سێوی بوون؛ یەتیم بوون؛ هێتم بوون؛ ئێتیم بوون؛ هەتیوکەوتن؛ هەتیم کەوتەی؛ بێ‌دای و باب بوون. هەروەها: **یتیم بودن**

یتیم کردن: هەتیوکردن؛ هەتیم‌کردن/ کەردەی؛ یەتیم‌کردن؛ هێتم‌کردن؛ بێ‌باب و دایک‌کردن؛ سێوی‌کردن ‹جنگ بسیاری از کودکان را یتیم کرد: شەڕ زۆرێک لە منداڵانی هەتیو کرد›.

**یتیمچه** / yatîmče/: [عربی/ فارسی] *اسم.* هەتیمچە؛ یەتیمچە؛ چێشتێکە لە باینجانی قاشکراوی ئاڵقەیی، پیواز، تەماتە، هێندێک گۆشت و تام و خوێ.

**یتیم‌نوازی** / yatîmnavāzî/: [عربی/ فارسی] *اسم.* کاری لاواندنەوە و یارمەتی دانی منداڵانی هەتیو. هەروەها: **یتیم‌نواز**

**یتیمی** / yatîmî/: [عربی] *اسم.* هەتیوی؛ هەتیمی؛ دۆخ یان چۆناوچۆنی بێ‌باب یان دایک بوون ‹بچه‌ها در یتیمی بزرگ شدند: منداڵەکان بە هەتیوی گەورە بوون›.

**یحتمل** / yahtamel/: [عربی] *قید.* لەوانەیە؛ وێ‌دەچێ؛ ڕەنگە؛ ڕەنگا؛ شایەت؛ شایەد؛ لەوە دەچێ؛ گاهەز؛ گاهەس ‹یحتمل او هم بیاید: لەوانەیە ئەویش بێت›.

**یخ** / yax/: *اسم.* سۆڵ؛ سەهۆڵ؛ سەهوڵ؛ یەخ؛ جەمد؛ کاک: ١. ئاوی لە بەر سەرما ڕەق‌هەڵاتوو ٢. هەر ماکێکی (گاز یان تراو) لە سەرمان و لە بەر تەوژم ڕەق‌هەڵاتوو.

◘ یخ خشک: یەخی وشک؛ دی‌ئۆکسیدی کەربونی یەکجار ساردەوەکراو و ڕەق‌هەڵاتوو

که بۆ ساردکردنەوە بەکار دێ و لە ۷۸,۵- دا ڕاستەوخۆ دەبێتە گاز.

▣ **یخ بستن:** ڕچیان؛ ڕچان؛ ڕچیای؛ قەمرین؛ قەرسین؛ قەرساندن؛ یەخ بەستن؛ یەخ بینتەی؛ قەڕماندن؛ کەرزین؛ بوونە سەهۆڵ؛ جەمدین؛ بیەی؛ بیای؛ لە بەر سارد بوونەوەی زۆر، ڕەق هەلاتن.

**یخ چیزی باز شدن:** یەخی شتێ بەر بوون؛ ڕچی شتێ بەر بوون ‹گوشت را بیرون بگذار، یخش باز شود: گۆشتەکە بنەدەرەوە با یەخەکەی بەر بێ›.

**یخ زدن:** ڕچان؛ ڕچیان؛ یەخ بەستن؛ یەخ کردن: ۱. ڕەق هەلاتن؛ کەسیرە بوون؛ گرسانی تراو یان گاز بە هۆی سەرماوە ۲. *[گفتاری]* وەبەر سەرما و سۆڵە کەوتن؛ بوونە سەهۆڵ؛ مەیاندن ‹دیشب توی راه یخ زدم: دوێنێشەو بە ڕێگادا ڕچام›.

**یخ کردن:** یەخ کردن: ۱. *[گفتاری]* ساردەوە بوون ‹چای یخ کرد: چایەکە ساردەو بوو› ۲. ڕەق بردنەوە/ بوونەوە؛ کەسیرە بوون لە سەرما؛ بوونە سەهۆڵ؛ ڕچان؛ ڕچ بەستن؛ ڕەقەوە بیەی؛ قەفلان؛ قەفلین؛ تەزین؛ تەزان؛ قەسران؛ قەسرین؛ قەڕمتین؛ کەرزین؛ ڕەق هەلاتن لە سەرما ‹یخ کردی، چیزی بپوش: ڕەقت بردەوە، شتێ لەبەر کە!›.

**یخ کسی باز شدن:** *[مجازی]* گرۆگاڵی کەسێ خۆش بوون؛ ڕووی کەسێ کرانەوە ‹کم ــ کم یخش باز شد و شروع کرد بە صحبت کردن با دیگران: وردە ـ وردە گرۆگاڵی خۆش بوو، دەستی کرد بە قسە کردن لەگەڵ ئەم و ئەودا›.

**یخ کسی نگرفتن:** *[مجازی]* دەفەی کەسێک دەنگ نەدان؛ بۆ کەسێک نەگرتن ‹خواست شیرینکاری کند، امّا یخش نگرفت: هات شیرینکاری بکا، بەلام دەفەی دەنگی نەدا›.

**یخ**[2]: *صفت.* ۱. سارد و سڕ؛ سار؛ سڕ؛ بێهەست و حاڵ ‹آدم یخی است: مرویەکی سارد و سڕە› ۲. سەهۆڵبەندان؛ زۆر سارد ‹اینجا هوا یخ است: لێرە هەوا سەهۆڵبەندانە›.

**یخاب** / yaxāb/: *اسم.* سەهۆڵاو؛ یەخاو؛ یەخاوە؛ ئەو ئاوە لە توانەوەی یەخ دروست دەبێ و وردە و لەتی یەخیشی تێدایە.

**یخبندان** / yaxbandān/: *صفت.* بەستەڵەک؛ بەسلەک؛ بەستەلۆک؛ بەسترک؛ سەهۆڵبەندان؛ سەهۆڵبەنان؛ شەختە؛ ڕچ؛ ڕەچ؛ یەخبەندان؛ یەخبەنان؛ سۆڵبەندان؛ ماسیان؛ یەخقەنان؛ بە بار و دۆخێ کە بووەتە هۆی بەستن ‹هوای یخبندان: هەوای بەستەلەک›.

**یخچال** / yaxčāl، ـها/: *اسم.* یەخچاڵ؛ سەهۆڵدان؛ سەهۆڵان: ۱. ساردینگ؛ دەزگایەکی کارەبایی وێنەی کومێد، سندووق یان هۆدە بۆ ساردکردنەوە و بەرگری لە گەنینی خواردەمەنی ۲. *[قدیمی]* بەفرەچاڵ؛ ئەو قووڵکە لە چیا بەفری تێدەکەن و دایدەپۆشن بۆ هاوین ۳. *[زمین‌شناسی]* بەفرەچاڵ؛ وەروەجالێ؛ پیرچالە؛ زاندۆر؛ نوالەی تراو کە بەفری ساڵەوساڵ ناتوێتەوە.

▣ **یخچال طبیعی:** بەفرەچاڵ؛ یەخەچاڵ؛ چاڵەبەفر؛ چاڵوەفر؛ زاندۆر؛ ئەو قولکە لە چیا کە بەفری ساڵەوساڵ ناتوێتەوە.

**یخدان** / yaxdān، ـها/: *اسم.* یەخدان: ۱. سندووقی هەڵگرتن و ڕاگرتنی یەخ و شتوماکی سارد ۲. *[قدیمی]* یەغان؛ یەغدان؛ سندووقی دارینی زەلام، بەتایبەت بۆ جل‌وبەرگ.

**یخ در بهشت** / yaxdarbehešt/: *اسم.* ۱. تێکەلاوی بەفر یان سەهۆڵ و شەربەتی ئاولیمۆ یان بلالووک ۲. مەشکەفی؛ مەسقەتی؛ تێکەلاوی نیشاستە و شەکر و ئاو کە دەیکولێنن هێندێک دەگرسێ، بە ساردی دەیخۆن.

**یخرفت** / yaxroft، ـها/: *اسم.* *[زمین‌شناسی]*

کۆمای بەرد و خۆڵی بن یەخچاڵ.

**یخزار** / yaxzār ، ـها/:/اسم. ۱. کێوی یەخ ۲. بەفرەچاڵی زۆر گەورە.

**یخزده** / yaxzade/: صفت. ۱. ڕچاو؛ ڕچیاگ ‹آب یخزده: ئاوی ڕچاو› ۲. [مجازی] سارد و سڕ؛ زۆر سارد ‹اتاق یخزده: دیوی سارد و سڕ›.

**یخزن** / yaxzan ، ـها/:/اسم. فریزر؛ بەفرینگ؛ قەرسینک.

**یخسار** / yaxsār ، ـها؛ ـان/:/اسم. سەهۆڵان؛ سەهۆڵستان؛ بەفرسان؛ بەر و بوومی پان و بەرین کە بەفر و یەخی زۆر دایپۆشیوە.

**یخساز** / yaxsāz ، ـها/:/اسم. یەخساز؛ کەرەستەیەک بۆ دروستکردنی یەخ.

**یخسازی** / yaxsāzî/:/اسم. سەهۆڵسازی؛ یەخسازی: ۱. کار و ڕەوتی دروستکردنی سەهۆڵ ۲. /ـها/ کارخانەی دروستکردنی یەخ.

**یخسوز** / yaxsûz/:/اسم. یەخگەز؛ کزەی پێست بە هۆی لێکەوتنی شتی زۆر سارد و دابەزینی کوتوپڕی دەما لەو شوێنەدا.

**یخشار** / yaxšar ، ـها؛ ـان/:/اسم. ۱. تافیٚ کە ئاوەکەی لە بازداندا بەستوویە ۲. شوێنێک لە لێژاییی کە تاشە سەهۆڵی لیٚ کەڵەکە بووە.

**یخشکن** / yaxšekan ، ـها/: صفت. یەخشکێن؛ یەخماڕ؛ لەبار بۆ شکاندنی ڕچە و یەخ ‹لاستیک یخشکن: لاستیکی یەخشکێن›.

**یخگشا** / yaxgošā/:/اسم. کاتی توانەوەی بەفر و سەهۆڵ بە هۆی گەرم بوونی هەوا.

**یخگیر** / yaxgîr ، ـها/:/اسم. یەخگر: ۱. کەرەستەیەکی وەک پەنگر بۆ هەڵگرتنی سەهۆڵ ۲. میلەی درێژی قولاپدار بۆ هەڵگرتن و ڕاگوێزانی قالبی گەورەی یەخ.

**یخمال** / yaxmāl/: صفت. یەخماڵ؛ یەخپاڵ؛ ساردەوە بوو بە وردە یەخ.

**یخمه** / yaxmeh/:/اسم. زوقم؛ زقم؛ زق؛ خووس؛ خووسار؛ سیخوار؛ سووخ؛ سووخار؛ خویس؛ خویز؛ ئاسلک؛ ئاسلکە؛ ئاڵشتی؛ ئاڵشک؛ شەڵتە؛ مژ و تۆزی سەهۆڵ بە هۆی تێپەڕینی هەوای سارد بە سەر ئاوی گەرمدا.

**یخنزن** / yaxnazan/: صفت. یەخنەکەر؛ خۆڕاگر و بەرگەگر لە بەرامبەر سەرمای زۆرەوە.

**یخنی** / yaxnî/:/اسم. [قدیمی] کەماو؛ یەخنی؛ چێشتی گوشتاوی چەور و خەست و خۆڵ.

**یخه** / yaxe/: [ترکی] ☜ **یقه**

**یخی** / yaxî/:/اسم. ۱. سەهۆڵفرۆش؛ یەخفرۆش؛ یەخورەش؛ فرۆشەری سەهۆڵ ۲. یەخی؛ بەستەنی یەخی؛ جۆریٚ بەستەنی بە تام و ڕەنگی جۆراوجۆرەوە.

**یخی**[2]: صفت. ۱. سەهۆڵی؛ یەخی؛ لە جنسی سەهۆڵ ‹کوه یخی: کێوی سەهۆلی› ۲. ڕچاو؛ یەخکردوو ‹گوشت یخی: گۆشتی ڕچاو›.

**ید** / yad/: [عربی] /اسم. [نامتداول] دەست؛ دەس.

▣ ید طولا: دەستی باڵا؛ دەست و دوو ‹او در حقەبازی، ید طولایی دارد: لە کلاوبازیدا دەستی باڵای هەیە›: **ید طولی**

ید طولی ☜ **ید طولا**

**ید** / yod/: [فرانسوی] /اسم. یود؛ توخمی کیمیایی ناکانزا لە دەستەی هالۆژن بە ژمارەی ئەتومی ۵۳ و کێشی ئەتومی ۱۲۶،۹۰ بلۆڕێکی قاوەیی تۆخە کە هەڵمی بنەوشی لیٚدەبێتەوە و زۆر ژەهراویە، لە وێنەگری، دەواسازی و زۆر کاریتری پیشەسازیدا بە کەڵک دیٚ.

**ـ ید** / îd/: ضمیر. ـ ن؛ ـ دیٚ؛ جێناوی لکاوی دووهەم کەسی کۆ ‹رفتید؛ می‌گویید؛ بدانید: ڕۆیشتن؛ دەڵێن؛ بزانن›.

**یدالله** / yadollāh/: [عربی] /اسم. ۱. دەستی خودا؛ دەس خوا ۲. دەسەڵاتی خودا؛ قۆڕەت خوا.

**یدک** / yadak ، ـها/: [ترکی] /اسم. یەدەک: ۱. ئەردەک؛ ئێردەک؛ ئێدەک؛ منیەک؛ یەختەرمە؛ یەختڕمە؛ یەدەگ؛ ئەسپیٚ کە بۆ

نۆره‌ پێ‌کردن ده‌گه‌ڵ سواردایه‌ ۲. که‌رسته‌ی ڕاگواستن که‌ موتۆری نیه‌ و ڕاده‌کێشرێت ۳. سپێر؛ پێته‌ک؛ یه‌ده‌کی.

▣ یدک کشیدن: ۱. به‌ دووی خۆدا ڕاکێشان؛ کێش‌کردن؛ یه‌ده‌ک کێشان ‹یک کشتی قایقشان را یدک می‌کشید: پاپۆڕێک لۆتکه‌که‌یانی ڕاده‌کێشا› ۲. *[تعریض]* خستنه‌ شوێن خۆ؛ له‌گه‌ڵ خۆ هێنان ‹چند نفر را هم یدک کشیده‌ و آورده‌ بود: چه‌ند که‌سیشی خستبووه‌ شوێن خۆی و هێنابوونی› ۳. بوون (له‌) ژێر سه‌ر؛ بۆ دواڕۆژ له‌ به‌ر ده‌سدا بوون ‹چهارتا شغل دارد دوتا را هم یدک می‌کشد!: چوار کاری هه‌ن و دووشی له‌ ژێر سه‌ردایه‌!›.

**یدک‌کش** / yadak.keš ، ـها/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* یه‌ده‌ک‌کێش؛ که‌رسته‌یه‌کی ڕاگواستن بۆ ڕاکێشانی که‌رسته‌یه‌کی‌تر.

**یدکی**[1] / yadakî ، ـها/: [ترکی] *اسم.* سپێر؛ پێته‌ک؛ یه‌ده‌کی؛ ئامێر یان له‌ته‌یه‌کی زیادی بۆ گۆڕانه‌وه‌ و له‌جێ‌نانی ئه‌وی کۆن یان شکاو.

**یدکی**[2]: *صفت.* سپێر؛ پێته‌ک؛ یه‌ده‌کی؛ به‌ دۆخ و چۆنیه‌تی جێگر بوون.

**یدیش** / yedîš/ ☜ **ییدیش**

**یراق** / yarāq ، ـها/: [ترکی] *اسم.* ۱. شێل؛ یه‌راق؛ زنبه‌ری سه‌ر و ملی ئه‌سپ ۲. جل و جۆر؛ ڕه‌ختی ئه‌سپ ۳. ئامێر و که‌رسته‌ی هه‌ڵواسراو یان پێوه‌نراو به‌ شتێکه‌وه‌ (وه‌ک هه‌وسار، ڕکێف و... یان قوڵف، چه‌فته‌ڕێز و لاولاوه‌ی درگا و په‌نجه‌ره‌).

**یراق‌آلات** / yarāqālāt/: [ترکی/ عربی] *اسم.* قوڵف‌ویه‌راق؛ سه‌رجه‌می قوڵف و چه‌فته‌ڕێز و له‌ولاوه‌ و هه‌رچی‌تر که‌ به‌ ده‌رگا و په‌نجه‌ره‌وه‌ ده‌لکێ.

**یراق‌دوزی** / yaraqdûzî ، ـها/: [ترکی/ فارسی] *اسم.* شێل‌دووری؛ یه‌راق‌دووری: ۱. هونه‌ر یان فه‌ننی دوورینی یه‌راق ۲. نه‌خشی جوانی سه‌ر جل‌وبه‌رگی ڕه‌سمی به‌ تاڵ و ڕیسی کانزایی.

**یربوع** / 'yarbû/: [عربی] ☜ **کَلاکموش**

**یربه‌یر** / yer-be-yer/: [ترکی] *صفت. [گفتاری]* پاک‌له‌پاک؛ سه‌ر به‌ سه‌ر؛ که‌س له‌ که‌س؛ ساف به‌ ساف ‹با این پنجاه تومانی که دادم حسابمان یربه‌یر شد: به‌م په‌نجا تمه‌نه‌ی دام حیسابمان پاک‌له‌پاک بوو›.

**یرتمه** / yortme, yurtme/: [ترکی] *اسم.* ته‌رات؛ ته‌ڕاد؛ ته‌راتێن؛ لۆقز؛ ڕه‌فت؛ ڕێوه‌ چوونی هێندێک به‌له‌زی گوێدرێژ به‌ شێوه‌یه‌ک که‌ ده‌ستی ڕاست و پێی چه‌پ و پێچه‌وانه‌که‌ی به‌ جووتی ده‌جووڵێنه‌وه‌: **یورتمه**

▣ یرتمه رفتن: ڕه‌فت‌کردن؛ ته‌ڕاد/ ته‌راتێن کردن.

**یرغه** / yorqe/: [ترکی] *اسم.* لۆقه‌؛ لۆق؛ گورگه‌لۆقه‌؛ گورگه‌لۆق؛ گوورلۆق؛ قۆتره‌؛ قۆرته‌؛ قۆته‌؛ قه‌تره‌؛ لۆقه‌لۆق؛ هۆرته‌؛ هۆڵته‌؛ وێرغه‌؛ یورغه‌؛ ئێرخه‌؛ دۆمانه‌؛ جۆرێ ڕه‌وتی ئه‌سپ و چاروا که‌ ده‌ست و لاقی لای ڕاست پێکه‌وه‌ و لای چه‌پیش پێکه‌وه‌ ده‌بزوێ: **یرقه؛ یورغه؛ یورقه**

▣ یرغه رفتن: به‌ لۆقه‌ چوون؛ به‌ وێرغه‌ ڕۆیشتن؛ گورگه‌لۆقه‌کردن؛ لۆقین؛ لۆقه‌لۆق ڕۆیین؛ مه‌ڕی.

**یرقان** / yaraqān/: [یونانی] *اسم.* زه‌رده‌یی؛ زه‌ردی؛ زه‌رده‌ی؛ زه‌ردانی؛ زه‌رکی؛ زه‌ردیوی؛ زه‌ردۆیی؛ زه‌ره‌ک؛ زه‌رۆکی؛ زه‌رتک؛ زه‌ره‌نگ؛ به‌زه‌ک؛ یه‌ره‌قان؛ چاڤمارقی؛ نه‌خۆشیه‌کی گیرۆیه‌ که‌ پێست و کاژ و سپێنه‌ی چاو به‌ هۆی زۆر بوونی زه‌رداو له‌ خوێندا، زه‌رد داده‌گه‌ڕێن.

**یرقانی** / yaraqānî/: [یونانی] *صفت.* زه‌ردوویی؛ زه‌ردانی ده‌رد؛ تووشیاری نه‌خۆشی زه‌رده‌یی.

**یرقه** / yorqe/: [ترکی] ☜ **یُرغه**

**یزدان** / yazdān/: *اسم. [ادبی]* یه‌زدان؛ خودا؛ خوا؛ خودێ؛ ئێزد؛ هۆما؛ هووما؛ هۆمان؛ هۆمای؛

هووومای.
یزدان‌شناخت / yazdānšenāxt/: /اسم. خواناسی؛ زانستی خواشناسی.
یزنه / yazne/: [ترکی] ☜ آیَزنه
یزیدی / yazîdî/: /اسم. ئیزەدی؛ ئیزیدی؛ ئێزدی؛ یەزیدی؛ یەزدی؛ داسنی: ۱. لقێکی ئایینی لە کوردستان کە مەلەک تاوس دەپەرەستن ۲. /ـها؛ ـان/ هەر یەکە لە هۆگران و شۆنەڕایانی ئەو لقە.
یسار / yasār/: [عربی] /اسم. /ادبی/ چەپ؛ چۆپ؛ چۆپە؛ چەپە؛ قەنبەل؛ چەپیل؛ لای چەپ.
یساول / yasāvol/: [ترکی] /اسم. یاساوڵ؛ کێشکچی؛ نگابان.
یسر / yosr، ـها/: [عربی] /اسم. یوسر؛ ویسر؛ مورونچە؛ چێوی دارێکی ڕەنگ ڕەشە تەسبێحی لێ‌دروست دەکەن.
یسوعی / yasû'î، ـها؛ ـان/: [عربی] /اسم. یەسووعی؛ ژیزۆئیت: ۱. لقێک لە ڕەبەنانی خاچ‌پەرستی کاتۆلیک ۲. هەرکام لە شۆنەڕایانی ئەو لقە * ژزوئیت
یشب / yašb، ـها/: [یونانی] /اسم. یەشب؛ بەردێکی ڕەش و پتەوە لە تۆکڵی سیلیسی گیاندارانی دەریایی بەدیهاتووە و وەک بەردی ئەزموون کەڵکی لێ دەگرن.
یشک / yašk/: /اسم. /قدیمی/ شفرە؛ کەلم؛ کەلپ؛ کەلبە؛ کلب؛ کەلوە؛ کەلپ؛ کەڵبە؛ شەلفە؛ بڕە؛ شرن؛ ددانی پێشەوەی گیانەوەرانی وەک بەراز و شێر.
یشم / yašm، ـها/: [یونانی] /اسم. یەشم؛ شەوە؛ شەوەی سەوز؛ بەردێکی گرانبایی کەسکی تۆخە کە زۆر ڕەق و تۆکمەیە.
یشمی[1] / yašmî/: [معرب] /اسم. یەشمی؛ ڕەنگی سەوزی تۆخ.
یشمی[2]: صفت. یەشمی؛ بە ڕەنگی سەوزی تۆخ.
یعقوبی / ya'qûbî/: [عبری] /اسم. یاقووبی: ۱. لقێک لە خاچ‌پەرستانی ڕۆژهەلاتی کە لە سەدەی شەشەمی زایینی لە سووریەدا سەریان هەڵدا و لە ناو سوریانیەکاندا پەرەیان سەند ۲. /ـها؛ ـان/ هەر یەکە لە شوێنکەوتووانی ئەو ڕێبازە.
یعنی / ya'nî/: [عربی] قید. یانیَ: ۱. واتا؛ واتە؛ یانێها؛ یانی ‹یزدان یعنی خدا: یەزدان واتا خوا› ۲. /گفتاری/ ئایا؛ ئەویَ ‹یعنی ممکن است روزی ما هم پولدار بشویم؟: یانی ئەبێ ڕۆژێک ئێمەش دەوڵەمەند ببینەوە؟› ۳. یانێها ‹یعنی من هم زبان خارجی بلدم: یانێها منیش زمانی بیانی دەزانم› ٤. لە ڕاستیدا ‹من زود رفتم، یعنی من زود نرفتم، بقیه دیر آمدند: ئەمن زوو ڕۆیشتم، لە ڕاستیدا من زوو نەڕۆیشتم، باقی دێر هاتن›.
یغر / yoqor/: [ترکی] ☜ یُقُر
یغلاوی / yaqlāvî/: [از ترکی] /اسم. یەغلەبی: ۱. /ـها/ دەفرە چێشتی دەسک و سەرەدار کە پتر بە سەربازی دەدەن: یقلاوی
یغما / yaqmā، ـها/: [ترکی] /اسم. /ادبی/ ۱. تاڵان؛ پوپڕ؛ پووڕ؛ پوویر؛ پویر؛ چەپاو؛ تالو؛ یاخمە؛ یاقما؛ تاڵان و تاژان؛ تاڵان و ماڵان ۲. تاڵانی؛ ئەوی بە تاڵان دەستکەوتووە.
یغماگر / yaqmāgar، ـها؛ ـان/: [ترکی/ فارسی] /اسم. /ادبی/ تاڵانکەر؛ چەپاوکەر؛ تاڵانچی.
یغور / yoqor/: [ترکی] ☜ یُقُر
یقر / yoqor، ـها/: [ترکی] صفت. /گفتاری/ زل: ۱. ناقۆلا؛ نەپۆڕ؛ ناپۆڕ؛ دشت؛ قولۆر؛ نارێک‌وپێک و ناشیرین ۲. زەلام؛ زل؛ گەورە؛ کەلەگەت؛ کەتە؛ گەپ؛ گۆپۆ * یغر؛ یغور؛ یقور
یقلاوی / yaqlāvî/: [از ترکی] ☜ یغلاوی
یقنعلی‌بقال / yaqn'alîbaqqāl/: [از عربی] /اسم. /تعریض/ حەپلی‌حەپاو؛ گەمژە؛ پیاوی سووک و چرووک ‹وقتی هر یقنعلی‌بقالی وزیر و وکیل بشود، کارها از این بهتر نمی‌شود: کاتێ هەر حەپلی‌حەپاوێک ببێتە وەزیر و نوێنەر، کار لەمە باشتر نابێ›.

**یقور** / yoqor/: [ترکی] ☜ **یُقُر**

**یقه** / yaqe ، ـها/: [ترکی]/اسم. قەمت؛ پێسیر؛ گوجو؛ ملەوانە؛ ملشان؛ ملیوان؛ ملشو؛ ملشۆ؛ گریبان؛ بەرستۆ؛ بەرسکوور؛ بەرستۆک؛ بەستووک؛ بەرچێڵە؛ شەبەک؛ زیی؛ ستکر؛ بەرۆ؛ بەرۆکە؛ بەرۆک؛ بەریک؛ بەرەکە؛ پستۆ؛ یەخێ؛ ئێخە؛ یاخە؛ یەخە؛ ووە؛ گرانی؛ بەرو؛ ملوان؛ قەو؛ وەرقەو؛ ئەو بەشە لە جلوبەرگ کە دەوری مل و سەر سینە دەگرێ ❊ **یخه** *[گفتاری]*

▣ **یقه اسکی**: یەخە ئیسکی؛ جۆرێک ملەوانەی جلوبەرگ کە بە سەر خویدا دەشکێتەوە و دەوراندەوری مل تا ژێر چەناگە دادەپۆشێ.

**یقه انکلیسی**: یەخە ئینگلیسی؛ جۆرێک ملیوانی کورت کە زۆرتر بۆ کراس دەبێ.

**یقه ایستاده**: جۆرێک ملیوان کە وەک شریتێکی باریک وایە و لە پێشەوە دوگمە دەخوات: **یقه حسنی**

**یقه باز**: یەخە باز؛ هەر جۆرە ملیوانی دانەشکاو کە لە پێشەوە بە شێوەی جۆراوجۆر بڕدراوە.

**یقه برگرد**: یەخەی هەڵگەڕاو؛ ملیوانێ کە بە سەر جلدا دەشکێتەوە.

**یقه حسنی** ☜ **یقه ایستاده**

**یقه خشتی**: یەخە خشتی؛ جۆرێک ملیوانی ئاواڵەیە کە لە بەرەوە چوارگۆشە بڕدراوە.

**یقه کتابی** ☜ **یقه ملوانی**

**یقه گرد**: یەخە گرد؛ جۆرێک ملیوانی ئاوەڵایە کە لە پێشەوە وەک کەمە بڕدراوە.

**یقه ملوانی**: جۆرێک ملیوان کە لە پشت ملەوە چوارگۆشەیە و لە پێشەوە بە چەشنی ۷ هەڵگەڕاوەتەوە: **یقه کتابی**

**یقه هفت**: یەخە حەفت؛ جۆرێک ملیوان کە لە پێشەوە وەک ژمارەی ۷ بڕدراوە.

▣ **یقه چاک زدن**: خۆ ڕنین؛ بەرۆکی خۆ دادڕین بە نیشانەی خەمباری، بەتایبەت لە تازیەدا.

**یقه‌ی خود را پاره کردن**: ١. بەرۆکی خۆ دادڕین ٢. *[کنایی]* خۆ لە دار و بەرد دان؛ هەوڵ و تەقالی زۆر دان.

**یقه‌ی کسی را چسبیدن / گرفتن**: بەرۆک بە کەسێک گرتن؛ بەرەک کەسێ گرتن؛ بۆ پێکردنی کارێکی ئەستەم بۆ لای کەسێک چوون و پا داگرتن.

**برای کسی یقه جر دادن/ پاره کردن**: زگ بۆ کەسێ درین؛ خۆ بۆ کەسێ بەکوشت دان؛ زۆر توند لایەنگری و پشتیوانی کەسێ کردن.

**یقه‌سفید** / yaqesefîd ، ـها/: [ترکی/ فارسی]/اسم. *[کنایی]* یەخەسپی؛ دەس‌چەرمگ؛ کارمەندی نووسینگە یان خاوەنی کار و باری وا سووک و خاوێن کە دەست و جل و بەرگی پیس نەبێ (وەک بژیشک، مامۆستا، خوێندکار، بازرگان و...).

**یقین** / yaqîn/: [عربی]/اسم. یەقین؛ دڵنیایی؛ خاترجەمی: ١. دڵڕاحەتی ‹یقین دارم که این کار درست است: دڵنیام ئەم کارە دروستە› ٢. باوەڕی پتەو ‹او به امانتداری برادرش یقین دارد: لە دەستپاکی براکەی خاترجەمە›.

▣ **یقین داشتن**: خاترجەم بوون؛ دڵنیا بوون؛ باوەڕ پێ بوون؛ باوەر بیەی؛ ئارخەیان بوون.

**یقین کردن**: دڵنیا بوون؛ بڕوا کردن؛ خاترجەم بوون؛ باوەڕکەردەی ‹یقین کردم که با هم سر و سرّی دارند: دڵنیا بووم کە پێکەوە کەین و بەینێکیان هەیە›.

**یقینا** / yaqînan/: [عربی] قید. بێ‌گومان؛ بێ‌شک؛ بێ‌سۆ؛ بە دڵنیایی ‹یقینا حق با او بود: بێ‌شک حەقی بەدەست بوو›.

**یقینی** / yaqînî/: [عربی] صفت. خاترجەمی؛ دڵنیایی؛ بێ‌شکی؛ بە مسۆگەری و براوەیی.

**یک**[1] / yek/: اسم. یەک؛ ییَک؛ ئێک؛ یاو؛ یەی؛ یۆ؛ یە؛ یەو: ١. یەکەمین ژمارەی سەرەکی لە زنجیرەژمارەی ئاسایی ☜ **عدد** ٢. هەر کام لە ئەندامانی دەستە ‹این یک؛ آن یک:

ئەم یەکە؛ ئەو یەکە›.

**یک**ٚ: *صفت*. یەک: ١. تاق؛ تاقانە؛ تاک؛ تاک و تەنیا؛ تەنیا و بێهاوتا ‹یک مرد: یەک پیاو› ٢. یەکەم ‹شمارەی یک: ژمارەی یەک›.

**یک الف بچە**: *[گفتاری]* منداڵۆکەیەک؛ منالە وردکەیی ‹دفعەی پیش کە دیدمش یک الف بچە بود: جاری پێشوو کە دیتم منداڵۆکەیەک بوو›.

**یک بام و دو هوا**: *[کنایی]* بانێک و دوو هەوا؛ دۆخ یان قسەی ناتەبا و دژ بە یەک.

**یک‌بەیک**: یەکە-یەکە؛ دانە-دانە؛ یەک‌بەیەک؛ دانەبەدانە؛ تاکە-تاکە؛ یۆ-یۆ؛ یەک-یەک؛ یەوبیەو؛ لبڕ-لبڕ؛ لب-لب؛ دانە-دانە؛ دەنک-دەنک؛ هەباهەب؛ کەت‌کەتە؛ گلە-گلە؛ بە شێوەی جیا-جیا و لە شوێن‌یەک ‹همە یک‌بەیک رفتند: هەموو یەکە-یەکە ڕۆیشتن›.

**یکی - یکی**

**یک پا گیوە و یک پا چارق**: *[کنایی]* تایەک کەوش و تایەک کڵاش؛ برسی و ڕووت؛ زۆر ڕەش و ڕووت ‹پارسال یک پا گیوە و یک پا چارق از دە آمدە، امسال صحبت ملیون می‌کند!: پارەکە تایەک کەوش و تایەک کڵاش لە دێوە هات، ئەمساڵ قسەی ملیۆن دەکا!›.

**یک دنیا/ عالم**: کۆلێ؛ دنیایەک؛ یەک دنیا؛ یەک عالەمە؛ هەمارێک؛ هەماریو ‹یک‌دنیا کار دارم: کۆلێ کارم هەیە›.

**یک فصل**: چینێک؛ تانێ؛ هێندێک؛ جۆشێ؛ جۆشیە ‹یک فصل دعوا کردیم: چینێک شەڕمان کرد›.

**یک گردو/ مویز و چهل قلندر**: *[کنایی]* بە حەوت ماڵ و تیانەیەک؛ بە دوازدە برا و کلاوێک؛ هێلکەی چل فەقێ؛ شتی کەم و داواکاری زۆر.

**یک هوا**: نەختێک؛ کەمێک؛ تۆزقاڵێک؛ تۆزێ؛ تۆزێک؛ کەمێو؛ داڵێو؛ کوچێو؛ دالیە؛ هەوایەک؛ هێندێک؛ چکێک ‹یک هوا کوچکتر بود: نەختێک بچووکتر بوو›.

**بە یک چشم بر هم زدن**: لە چاوترووکانێکدا؛ لە چاو قووچانێکدا؛ لە کاتێکی زۆر کەمدا ‹بە یک چشم بر هم زدن، کیف را بردە بودند: لە چاوترووکانێکدا کیفەکەیان بردبوو›.

▣ **یک پا لب گور داشتن**: *[کنایی]* پا لە لچ قەور لەرزین؛ پێ لە لێوی گۆڕدا بوون؛ مردووی بەشی زیندووخۆر بوون؛ لە سەکەراتدا بوون؛ لە مردن نزیک بوون.

**یک پای کاری لنگیدن**: شتێکی کەم بوون؛ کەمی لە کاردا هەبوون؛ ناتەواو بوون.

**یک دست پیش و یک دست پس داشتن**: *[کنایی]* کەوتنە هەواری خاڵی؛ ڕووت و ڕەجاڵ بوون؛ زۆر دەستەنگ و فەقیر بوون.

**یک دل نە صد دل عاشق شدن**: *[مجازی]* یەکجار ئەویندار بوون.

**یک دهان خواندن**: دەمێ خوەندن؛ کەمێک گۆرانی خوێندن.

**یک سر و هزار سودا داشتن**: *[کنایی]* سەت سەری بێ دەلاک تاشین؛ هەر تیرێک لە کەندالێک دان؛ هەزار خەیاڵ لە دڵدا بوون؛ بیر و ڕا و گەلالە و کاری زۆر و ناموژمەڵ لە سەردا بوون.

**یک گوش در و یک گوش دروازە بودن**: *[مجازی]* لە گوێکەوە هاتن و لەو گوێوە دەرچوون؛ بەم گوێ گرتن و بەو گوێ دەرکردن؛ گوێ‌نەدەر و کەمتەرخەم بوون.

**یک کلاغ چهل کلاغ کردن**: *[کنایی]* کایەک کردنە کێفێ؛ لە گەڕاندنەوەی ڕووداوێکدا فشەکردن.

**یک مو از سر کسی کم نشدن**: *[کنایی]* گوڵی کەسێ کاڵ نەبوونەوە ‹نمی‌گذارم یک مو از سرش کم شود: ناهێڵم گوڵی کاڵ بێتەوە›.

**یک واو را هم نینداختن**: *[کنایی]* نووختەیەکیش دانەخستن؛ خاڵێکیش لە بیر

نەکردن ‹از اول تا آخر از حفظ خواند و یک واو را هم نینداخت: هەمووی لە بەر خوێندەوە و نوختەیەکیشی دانەخست›.

**با یک دست دو هندوانه برداشتن:** *[کنایی]* بە دەستێک دوو شووتی هەڵگرتن؛ دوو یان چەند کار پێکەوە کردن ‹می‌خواهد با یک دست دو هندوانه بردارد: دەیەوێ بە دەستێک دوو شووتی هەڵبگرێ›.

**به یک چشم نگاه کردن:** *[مجازی]* بە چاوێک بۆ ڕوانین؛ وەک یەک چاولێکردن؛ جیاوازی دانەنان ‹او همەی بچەها را به یک چشم نگاه می‌کرد: بۆ هەموو منداڵان بە چاوێک دەیڕوانی›.

**یک** [۳]: *قید. [گفتاری]* ۱. وا؛ ـ ێ؛ ـ یێک؛ وەها؛ ئاوەها ‹یک شوت‌هایی می‌زند که نگو!: شووتی وای دەکرد مەپرسە!› ۲. تەنیا؛ هەر ‹یک امروز را به من مهلت بده!: تەنیا ئەمڕۆم دەرفەت بدەرێ!›.

**یک ـ** [٤]: *پیشوازه.* یەک ـ ؛ تاکە ـ ؛ تاقە ـ ؛ تاقی ـ ؛ یەی ـ : ۱. بە یەک دانەوە ‹یک‌چشم: یەکچاو› ۲. بە تەنیایی؛ بەبێ کەس ‹یکباره؛ یکتنه: یەکجاری؛ تاقی‌تەنێ› ۳. بە وێکچوویی و وێکڕایی ‹یکسان؛ یکدل: یەکسان؛ یەکدڵ›.

**یکا** / yekā ، ـها/: *اسم.* یەکە؛ چەنیەتیەکی دیاریکراو کە وەک پێومان (بۆ درێژایی، قورسایی، گەرما و بارستایی) ڕەچاوکراوە.

**یکان** / yekān/: *اسم.* ۱. جمعِ ☜ **یکّه** ۲. یەکان؛ تاکان؛ یەکەمین پلە لە ژمارەی ئاسایی ۳. ☜ **یگان**

**یک اندر دو** / yekandardo/: *قید.* بێ سێ و دوو؛ یەکجاری؛ لە ناکاو و بە بێ پێشەکی ‹یک‌اندردو شروع کرد به گلەگزاری: بێ سێ و دوو دەستی کرد بە گلەیی کردن›.

**یکایک** / yekāyek/: *قید.* یەکە ـ یەکە؛ دانە بە دانە؛ دانە ـ دانە؛ تەک ـ تەک؛ یەک ـ یەک؛ خڵی‌وەخڵی؛ یۆ ـ یۆ؛ یوە ـ یوە ‹یکایک همه را بازرسی بدنی کردند: یەکە‌ـیەکە بە هەموودا گەڕان›.

**یکبارگی** / yekbāregî/: *قید.* یەکجاری؛ یەکجارەکی؛ بە یەکجاری؛ یەکجار؛ لە یەک کەڕەتدا ‹یکبارگی بگو نمی‌خواهم پولت را بدهم: یەکجاری بێژە نامەوێ پارەکەت بدەمەوە›.

**یکبارمصرف** / yekbārmasraf ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* یەکجاری؛ تایبەتی بۆ یەک جار کەڵک لێ‌وەرگرتن ‹لیوان یکبارمصرف: پەرداخی یەکجاری›.

**یکباره** / yekbāre/: *قید.* یەکجارەکی؛ یەکڕا؛ ناکاو؛ بە یەکجاری؛ بە یەک‌کەڕەت؛ یەکجارەکی ‹یکباره همه را بلند کرد: یەکجارەکی هەمووی بەرز کردەوە›.

**یک‌بری** / yekbarî/ ☜ **یک‌وری**

**یک‌بعدی** / yekbo'dî ، ـها/: [فارسی/ عربی] *صفت.* یەک‌لا؛ یەک‌لایی؛ یەک‌لایەن؛ یەک‌لایەنی: ۱. بە تەنیا لە یەک لاوە ۲. *[مجازی]* بە بێ ڕوانین بۆ لایەنێکی‌تر ‹دید یک‌بعدی: ڕوانگەی یەک‌لایی›.

**یک‌بند** / yekband/ ☜ **یک‌ریز**

**یکپارچگی** / yekpārčegî/: *اسم.* یەکپارچەیی؛ دۆخ یان چۆنیەتی یەکدەست بوون.

**یکپارچه** / yekpārče/: *صفت.* یەک‌تیکە؛ یەکپارچە؛ ئێک‌پاژ؛ یەکپارە؛ یەکشەق؛ لەت‌نەکراو؛ بەبێ درز و قەڵش یان پەرژ و بڵاوی ‹سنگ یکپارچه: بەردی یەک‌تیکە›.

**یکپارچه** [۲]: *قید.* یەکسەر؛ یەکسەرە؛ یەکپارچە؛ تەواو؛ تەواوکەماڵ ‹خانه یکپارچه آتش شد: ماڵەکە یەکسەر بوو بە گڕ›.

**یکپایه** / yekpāye/: *صفت. [گیاه‌شناسی]* یەک‌خانە؛ یەک‌جێگە؛ بە گوڵی نێر و مێی جیا، بەڵام لە سەر بتەیەکەوە. بەرانبەر: **دوپایه**

**یکتا** / yektā/: *صفت.* تەنیا؛ بێ‌هاوتا؛ بێ‌وێنە؛ تاقانە؛ تاک؛ تەنیا؛ تاکانە؛ یەکتا؛ بێ‌هەمپا.

**یکتایی** / yektā'î/ ☜ **یکتایی**

یکتاپرستی / yektāparastî/: *اسم.* تاک‌پەرستی؛ یەک‌پەرەستی؛ یەکتاپەرستی؛ بڕوا بە تاک بوونی خودا و پەرستنی تەنیا ئەو. هەروەها: **یکتاپرست**

یکتایی / yektāyî/: *اسم.* تاقی؛ تاکی؛ یەکتایی؛ بێ‌وێنەیی: **یکتائی**

یکتنه / yektane/: *قید.* (بە) تاقی تەنیا؛ بە تاقێ تەنێ؛ تاق و تەنیا؛ بە تەنێ؛ بە تەنیا؛ تەنیابالێ؛ تاک و تەنەکیا؛ یەکبال ‹یکتنه همه را فراری داد: تاقی تەنێ هەموویانی ڕاونا›.

یکجا / yekcā/: *قید.* یەکجێ؛ سەرجەم: ۱. بەجارێ؛ یەکڕا ‹او همیشه یکجا خرید می‌کند: همیشه یەکجێ شت دەکڕێ› ۲. تێکڕا؛ بە تێکڕا؛ بە سەر یەکەوە ‹همه را یکجا ببر!: هەمووی یەکجێ بەرە!›.

یکجانبه / yekcānebe/: [فارسی/ عربی/ فارسی] *صفت.* یەک‌لایەنە؛ سەر بە لایەک ‹این قضاوت یکجانبه است: ئەم داوەریە یەک‌لایەنەیە›.

یکچرخه / yekčarxe، ـها/: *اسم.* یەکچەرخە؛ یەک‌تەگەرە؛ یەک‌قول؛ کەرستەی ڕاگواستن بە یەک تەگەرەوە.

یکچند / yekčand/: *قید.* *[ادبی]* تاوێک؛ ماوەیەک؛ ماوەیێک؛ هێندێک؛ چەندێ؛ کەمێ؛ چکێ؛ قەدێک؛ هەلێک؛ چەلانێک ‹یکچند صبر کن تا کارم تمام می‌شود: تاوێک ڕاوەستە تا کارم دوایی دێ›.

یکدرمیان / yekdarmiyān/: *قید.* ناوە ــ ناوە؛ ناوەژیە؛ یەک‌نەیەکێ؛ یەک‌نایەک؛ یەکێ‌نەیەکێ ‹درختها را یکدرمیان بریدند: دارەکانیان ناوە ــ ناوە بڕی›.

یکدست / yekdast/: *صفت.* یەکدەست؛ یەکدەس: ۱. لابال؛ یەکدەستە؛ بە تەنیا یەک دەستەوە ‹مرد یکدست: پیاوی یەکدەست› ۲. یەکپارچە؛ یەکجۆر؛ هاودەنگ؛ یەوجوس ‹سفید یکدست: سپی یەکدەست›.

یکدستی / yekdastî/: *اسم.* یەکدەستی؛ دۆخ یا چۆنیەتی یەکدەست بوون.

یکدستی: *قید.* یەکدەستی؛ یەکدەسی؛ (بە) یەکدەست؛ یەکدەست ‹یکدستی کار می‌کرد: یەکدەستی کاری دەکرد›.

◘ یکدستی زدن: *[مجازی]* تەڵەکەبازی کردن؛ فێڵ کردن.

یکدستی گرفتن: *[مجازی]* سووک لێ نەوین؛ بایەخ پێ نەدان.

یکدل / yekdel/: *صفت. [مجازی]* هاودەنگ؛ هاودڵ؛ یەکڕا؛ یەکدڵ.

یکدلی / yekdelî/: *اسم. [مجازی]* هاودەنگی؛ هاودڵی؛ یەکدڵی.

یکدندگی / yekdandegî/: *اسم. [مجازی]* لاساری؛ سەرسەختی؛ بلەوەزی؛ پێداگری لە سەر قسە و بیر و بۆچوونی خۆ.

یکدنده / yekdande، ـها/: *صفت. [مجازی، گفتاری]* لاسار؛ سەرسەخت؛ بلەوەز؛ سەرڕەق.

یکدیگر / yekdîgar/: *ضمیر.* یەکتر؛ یەکتری؛ یەکترین؛ یۆبینوو؛ یەوبینان؛ یۆنا؛ یەونا؛ یەوبنا؛ یەک‌یەکێ؛ یەمنۆ؛ هەودوو؛ ئێکتر؛ یەولۆ؛ یەومن؛ یۆی؛ یۆترینی؛ هەنترین ‹بە یکدیگر گفتند: «بهتر است برویم»: بە یەکتریان گوت: «باشترە بڕۆین»›.

یکراست / yekrāst/: *قید.* یەکسەر؛ یەکسەرە؛ یەکشەق؛ یەکە و ڕاست؛ ڕێک؛ ڕێک و ڕاست؛ یەکڕاس؛ یەکڕاست؛ ڕاست و بێ‌بادانەوە ‹این جاده یکراست می‌رود کامیاران: ئەم جادە یەکسەر دەڕواتە کامیاران›.

یکرنگ / yekrang/: *صفت.* ۱. هاوڕەنگ؛ بە ڕەنگی وەک یەکەوە ۲. *[مجازی]* یەکڕوو؛ ڕاست و ڕەوان؛ بێ‌درۆ و دووڕوویی؛ بەبێ دووڕوویی و ڕیاکاری. هەروەها: **یکرنگی**

یکرو / yekrû/: *صفت.* یەکڕوو؛ یەک‌بەر؛ بە تەنیا یەک ڕوو یان یەک ئاستەڕەوە.

**یک‌ریز** / yekrîz/: *قید. [گفتاری]* لە سەر یەک؛ یەکرێز؛ یەکسەرە؛ لە پەسا؛ بێ‌وچان؛ پەساپەس؛ یەکشەق؛ پەساـ پەسا؛ لێکداـ لێکدا؛ پەیتاـ پەیتا؛ هەیتاـ هەیتا؛ هەیتەـ هەیتە ‹یکریز حرف می‌زد: لە سەر یەک قسەی دەکرد›: **یک‌بند**

**یکسان** / yeksān/: *صفت.* یەکسان؛ هاوتا؛ هاوسان؛ وەک‌یەک؛ هاوچەشن؛ یەکچەشن؛ بەرانبەر؛ تایبەتمەندی دوو یان چەند شت کە لە باری بیچم، ئەندازە یان نرخەوە وەکوو یەکن ‹رنگشان یکسان است: ڕەنگیان یەکسانە›.

**یکسان‌سازی** / yeksānsazî/: *اسم.* یەکسان‌سازی؛ کار و ڕەوتی یەک‌جۆرکردنەوە؛ وەک یەک لێ کردن ‹یکسان‌سازی حقوق کارمندان: یەکسان‌سازیی مووچەی کارگێران›.

**یک‌سر و دوگوش** / yeksar-o-dogûš/: *اسم.* سەخری‌جن؛ بوونەوەرێکی خەیاڵی کە منداڵی پێ دەترسێنن.

**یکسره**[1] / yeksare/: *صفت.* یەکسەرە: ١. یەی سەرە؛ بە یەک‌لا، ڕێگە یان درێژیەوە ‹بلیط یکسره: پسووڵەی یەکسەرە› ٢. یەکجاری؛ یەکجارە؛ یەکجارەکی؛ بەبێ براونەوە ‹مدرسەی آرام یکسره است: قوتابخانەی ئارام یەکسەرەیە› ٣. *[مجازی]* یەک‌لا؛ یەک‌لایی؛ بە لایەکدا کەوتوو ‹کار را یکسره کن!: کارەکە یەک‌لایی بکەوە!›. هەروەها: **یکسره بودن؛ یکسره شدن؛ یکسره کردن**

**یکسره**[2]: *قید.* یەکسەرە: ١. ڕاست؛ بە تەواوی؛ تەواو؛ ڕێک؛ پاک؛ بێ‌وێستان و برانەوە ‹یکسره رفت توی دره: ڕاست چووە ناو دۆڵەوە› ٢. پێکڕا؛ تێکڕا؛ بە گشتی؛ تەواو ‹همه چیز یکسره خراب شد: هەموو شتێ پێکڕا خرا بوو›.

**یکسوساز** / yeksûsāz، ـها/: *اسم.* کەرستەیێ کە کارەبای چەلاوچەلی دەکاتە ڕاستەوخۆ: **راستگر؛ یکسوکننده**

**یکسوکننده** / yeksûkonande/ ☜ **یکسوساز**

**یکشنبه** / yekšambe,-šanbe، ـها/: [فارسی/ آرامی]/*اسم.* یەکشەم؛ یەکشەممۆ؛ یەکشەممە؛ یەکشەمە؛ یەکشەمبی؛ یەکشەمی؛ یەکشەوە؛ یەوشەوا؛ یەوشەوە؛ پازار؛ لەحەد؛ کێراکی؛ ناوی دووهەمین ڕۆژی حەفتە (دوای شەممە).

**یکشنبه‌شب** / yekšambešab, -šanbe-، ـها/: [فارسی/ آرامی/ فارسی]/*اسم.* شەوی/ شەو دووشەممە؛ شەوی پاش ڕۆژی یەک‌شەممە.

**یکصد** / yeksad/: *اسم.* سەد؛ سەت؛ یەکسەد. هەروەها: **یکصدم؛ یکصدمی؛ یکصدمین**

**یکصدا** / yeksedā/: [فارسی/ عربی] *قید.* یەکدەنگ: ١. بە کۆڕ؛ بە کۆمەڵ ‹بچەها یکصدا آواز می‌خواندند: منداڵەکان بەیەکدەنگ ئاوازیان دەخوێند› ٢. *[کنایی]* پێکەوە؛ پاڵ‌بەپاڵی یەک ‹مردم یکصدا برخاستند: خەڵک بەیەکدەنگ هەستانەوە›.

**یکضرب** / yekzarb/: [فارسی/ عربی] *قید.* یەک‌تەکان؛ یەکجێ؛ یەک‌زەرب؛ یەک‌ڕاست ‹وزنە را یکضرب بلند کرد: وەزنەکەی یەک‌تەکان بەرز کردەوە›.

**یکطرفه**[1] / yektarafe/: [فارسی/ عربی] *صفت.* یەک‌لایەنە؛ یەک‌تەرەفە؛ یەی‌لا ‹خیابان یکطرفه: شەقامی یەک‌لایەنە›.

**یکطرفه**[2]: *قید.* یەک‌لا؛ یەک‌لایەنە: ١. لە لایەن یەکێک لە بڕیاردەرانەوە ‹قرارداد را یکطرفه باطل کرد: پەیمانەکەی یەک‌لایەنە هەڵوەشاندەوە› ٢. *[کنایی]* بە لایەکدا؛ یەکلایی ‹بالاخره پس از چند ماه کار را یکطرفه کردند و از هم جدا شدند: ئاخری دوای چەن مانگ کارەکەیان یەک‌لا کردەوە و لە یەک جوێ بوونەوە›.

**یک‌طرفی** / yektarafî/: [فارسی/ عربی] *صفت.* یەک‌لا؛ یەک‌لایەنە؛ سەر بە لایەنێک.

▣ یک‌طرفی شدن / کردن کاری: یەک‌لا بوونەوە/ کردنەوەی کارێک ‹بهتر است کار یک‌طرفی شود: چاکترە کارەکە یەک‌لا ببێتەوە›.

یک‌قرانی / yekqerānî ، ـها/: [فارسی/ عربی] اسم. تاکەقەرانی؛ یەک‌قرانی؛ سکەی ئێرانی بایی یەک ڕیاڵ.

یک‌قل‌دوقل / ye(k)qoldoqol/: اسم. قەمچان؛ قاچان؛ قەمچیانی؛ بازەلان؛ بازەلێن؛ بازەڵە؛ ڕێخان؛ کایەی دوو یان چەن کەسە بە پێنج بەرد کە بە جۆرگەلێکی تایبەت هەڵیدەخەن و دەیگرنەوە.

یک‌قلم / yekqalam/: [فارسی/ عربی] قید. *[گفتاری]* ۱. دانەیەک؛ دانێک؛ یەک‌قەڵەم؛ تاکێک؛ یەکێ؛ تەنیا یەکێ ‹یک‌قلم از کارهایش دزدی از انبار بود: یەک‌دانێک لە کارەکانی دزی لە هەمار بوو› ۲. یەکجارەکی؛ یەکجاری؛ پاک؛ یەکسەر؛ یەکجێ ‹یک‌قلم همه را برد: یەکجێ گشتی برد›.

یک‌قندی / yekqandî ، ـها/: [فارسی/ سنسکریت] اسم. *[شیمی]* یەک‌قەندی؛ هیدرات کەربونی بە سێ تا حەوت کەربونەوە.

یک‌کاره / yek.kāre/: قید. *[گفتاری]* یەکەو؛ یەکهەو؛ یەکەندەردوو؛ یەک‌کەڕەت ‹تا آمدم یک‌کاره بلند شد و رفت: تا هاتم یەکەو هەستاو ڕۆیشت›.

یک‌کاسه / yek.kāse/: [فارسی/ از عربی] صفت. یەکجێ ‹همەی درآمدها را یک‌کاسه بکنید تا معلوم شود چه دارید: هەموو داهاتەکان یەکجێ بکەنەوە تا دەرکەوێ چتان هەیە›.

یک‌کلام / yek.kalām/: [فارسی/ عربی] قید. ۱. یەکدەنگ؛ پێکەوە؛ پاڵ‌بەپاڵی یەک ‹همه یک‌کلام به این موضوع اعتراض داشتند: هەموو یەکدەنگ بەرهەڵستی ئەم بابەتە بوون› ۲. *[کنایی]* بێ‌چەقە؛ بەبێ چەقە و ڕەقە؛ بێ‌چەقەچەق ‹قیمتهای ما یک‌کلام است: نرخەکانی ئێمە بێ‌چەقەیە› ۳. یەوفەک؛ یەک‌قسە؛ بێ ڕوودەروایسی.

یک‌کم / yek.kam/: صفت. *[گفتاری]* هێندێک؛ کەمێک: ۱. شتێکی کەم ‹یک‌کم شکر بریز توی چای: هێندێک شەکر بکە نێو چایەکە› ۲. تاوێک؛ بۆ ماوەیەکی کەم ‹بگذار یک‌کم بخوابم: بێڵە تاوێک بنووم›.

یک‌لا / yeklā/: صفت. یەک‌لا؛ یەک‌لۆ؛ یەک‌لایی؛ یەک‌لۆنە: ۱. یەکبەر؛ یەک‌قەد؛ یەوقات؛ یەک‌تۆ؛ بە تاکەلۆیەکەوە ‹کاغذ یک‌لا: کاغەزی یەک‌لایی› ۲. بە تەنیا یەک تاڵەوە ‹نخ یک‌لا: بەنی یەک‌لا›.

یک‌لاقبا / yeklāqabā ، ـها/: [فارسی/ عربی] صفت. *[مجازی]* بێ‌ئەنوا؛ دەستەنگ؛ بەلەنگاز؛ ڕووت؛ دەست‌کورت ‹ما آدمهای یک‌لاقبا غلط می‌کنیم موز بخوریم: ئێمەی دەست‌کورت غەڵەت بکەین مۆز بخۆین›.

یکم / yekom/: صفت. یەکەم؛ بە پلە، ڕیز یان جێگەی یەکەمەوە.

یکمی / yekomî/: ضمیر. یەکەمی؛ ئەوەی کە لە پلەی یەکەمدایە.

یکمین / yekomîn/: صفت. یەکەمین؛ هەوەڵین؛ ئەوەڵین؛ بە تەرتیب و پلە و جێگای یەکەمەوە.

یکنواخت / yeknavāxt/: صفت. یەکهاوی؛ یەکجۆر؛ یەکجوور؛ چوویەک؛ بەبێ ئاڵ‌وگۆڕ ‹صدای یکنواخت؛ حرکت یکنواخت: دەنگی یەکهاوی؛ بزاوی یەکهاو›. هەروەها: **یکنواختی**

یکوجبی / yekvacabî ، ـها/: صفت. *[مجازی]* ۱. بستەبالا؛ بنگووسەبالا؛ کورتەبالا؛ بووچکەڵ؛ بیچکەلانە ۲. بستەجێگا؛ بنگووسەجێ؛ زۆر چکۆلە ‹توی این خانەی یکوجبی چطور زندگی می‌کنید؟!: لەم ماڵە بستەجێدا چۆن دەژین؟!›.

یکوری / yekvarî/: قید. لابەلا؛ لار؛ لار و لوێر؛ لار و لەوێر؛ یەک‌وەری؛ یەووەری؛ کشتکانی؛ کێشتکۆنی ‹یکوری نشسته بود: لابەلا دانیشتبوو›: **یک‌بری**

یکه / yekke/: اسم. ۱. /یکان/ تاک؛ تەک؛ تەنیا؛ تەرەجە ۲. *[گفتاری]* تەکان؛ شەکان؛ تەکانە؛ گڤۆردی؛ گڤردی؛ وەرچسە؛ لێوە.

⊡ **یکه خوردن**: *[مجازی]* ڕاپەڕین؛ ڕاجلفین؛ ڕاچەنین؛ لێ بوون؛ ڕاچڵەکین؛ داچڵەکان؛ داچڵەکیان؛ داچڵەکین؛ هەڵچرچگیان؛ جەنقین؛ ڤابرن؛ دڵ ڕاچەنین؛ ڕاجەکانی دڵ؛ خەجڵین؛ کۆ خورادن؛ کۆ خواردنەوە؛ داخرپان؛ داخورپیان؛ داخرپیان؛ داخورپین؛ داخورپان؛ ڤەگالیان؛ ئەرەچڵەکیەی؛ چڵەکیایرە؛ لە ترسان یان لە خەبەری سەمەرە داترووسکان.

**یکه**٢: *صفت.* تاک؛ تاق؛ تەنیا ‹یکه و تنهاست: و تەنیایە›.

**یکه ـ**٣: *پیشوازه.* تاقە ـ؛ تاکە ـ؛ بەبێ هاوتا ‹یکەسوار: تاقەسوار›.

**یکه‌بزن** / yekkebezan ، ـها/: *صفت.* بلەربەزێن؛ فرز و بەهێز لە شەڕ و داوا.

**یکه‌تاز** / yekketāz/: *صفت.* لەزگین؛ پێشڕەو؛ بێ‌هاوتا لە پێشبڕکێدا.

**یکهزار** / yekhezār/: *اسم.* هەزار؛ یەکهەزار.
هەروەها: **یکهزارمی؛ یکهزارمین**

**یکهزارم** / yekhezārom ، ـها؛ ـان/: *اسم.* هەزارەک؛ هەزاریەک؛ لە هەزار پاژ پاژێک.

**یکه‌سوار** / yekke.savār ، ـها؛ ـان/: *صفت.* شۆڕەسوار؛ تاکەسوار؛ تاقەسوار؛ فرز و لێهاتوو لە سوارکاریدا.

**یکهو** / yekho, yekho: /: *قید.* *[گفتاری]* کتوپڕ؛ کوتوپڕ؛ کتۆپڕ؛ هەنی؛ ناکاو؛ لەنکاو؛ لە ناکاو؛ ناقا؛ لەپڕ؛ لەپڕدا؛ لەپڕا؛ لەپڕایەکی؛ لەپڕێ؛ گز و گومبەت؛ گوز و گومەت؛ لەپڕ و ناکاو؛ لەپڕ و نەکاو؛ گز و گۆم؛ کوتومزرەقی؛ لووت و بزووت؛ هێک؛ نکاو؛ هاکۆ؛ نش؛ نشکافک؛ نشکاف؛ نشک؛ نشکا؛ نشگاف؛ نشکێڤە؛ نوکم؛ یەکڕا؛ گوز؛ یەک کەڕەت؛ ژنشکاف؛ یەکهۆ؛ یەکهەو؛ ناخلاف ‹یکهو غش کرد و افتاد: لە سەر خۆی چوو و کەوت›.

**یکه و تنها** / yekke-vo-tanhā/: *قید.* *[گفتاری]* (بە) تاق و تەنیا؛ بە تاکی تەنێ؛ بە تەنێ؛ بە تەنیایی؛ تاق و تەنەکیا؛ بە تاقی تەنیا ‹یکه و تنها همه‌ی کارها را اداره می‌کند: هەموو کارەکان بەڕێوە دەبا›.

**یکی**١ / yekî/: *اسم.* *[گفتاری]* یەک؛ یەکێک؛ یەکێ؛ ئێکێک؛ یۆ؛ یوە؛ هەر کام لە ئەندامانی کۆئەندامێک ‹آن یکی را بده!؛ یکی بردار!؛ کدام یکی؟: ئەو بدە!؛ هەڵگرە!؛ کام؟›.

**یکی**٢: *صفت.* یەک؛ یەکێ؛ یەکێک؛ دانێک؛ دانەیەک؛ یەکدانە؛ یۆ؛ یوە ‹یکی از کتابها را به من بدهید: لەو کتێبانەم پێ بدەن›.

**یکی**٣: *ضمیر.* یەکێک؛ یەکێ؛ یۆ؛ یوە: ١. نەفەرێک؛ یەک نەفەر؛ کەسێک ‹یکی زنگ زد و شما را خواست: زەنگی لێدا و ئێوەی دەویست› ٢. شتێکی دیاریکراو ‹از بشقابها یکی شکسته است: لە دەوریەکان شکاوە›.

⊡ **یکی به نعل و یکی به میخ زدن**: *[کنایی]* لە پێک و لە ماپێکیش دان؛ یەک بۆ باجی و یەک بۆ حاجی؛ لە ژێرەوە هەی کردن، لە سەرەوە دەی کردن؛ بە هەر دوولادا خوێندن؛ بە قازانجی هەر دوو لای شەڕ و داوا جوولانەوە یان قسە کردن.

**یکی‌بدو** / yekîbedo ، ـها/: *اسم.* *[گفتاری]* یەکودوو؛ دەمەدەمانێ؛ گلتە؛ دەمەقاڵە؛ دەمەقاڵێ؛ بنار؛ بناشت ‹با من یکی‌بدو نکن!: لەگەڵ مەکە!›.

**یکی‌یکدانه** / yekîyekdāne ، ـها/: *صفت.* *[گفتاری]* تاقانە؛ تاکانە؛ یەوەک؛ یەوەکەی ‹دختر یکی‌یکدانه: کچی›.

**یکی ـ یکی** / yekîyekî/ ☜ یک به یک، **یک**

**یگان** / yegān ، ـها/: *اسم.* یگان؛ بەشێک لە دامەزراوەی چەکداری کە ڕێکخراوەیەکی تایبەتی بۆ ڕەچاو کرابێت: **یکان-٣**

**یگانگی** / yegānegî/: *اسم.* ١. تاقانەیی؛ بێ‌هاوتایی ٢. هاودەستی؛ هاوبیری؛ یەکڕایی

۳. *[مجازی]* هاوده‌نگی؛ دۆستی و برایەتی.

یگانه / yegāne/: *صفت.* ۱. بێ‌هاوتا؛ بێ‌هامپا؛ بێ‌وێنه؛ تاکانه؛ تاقانه؛ تەنێ؛ تەنیا ‹خدای یگانه: خودای بێ‌هاوتا› ۲. یەکگرتوو؛ هاوبیر؛ هاودەنگ؛ یەکڕا ‹ملت یگانه: گەلی یەکگرتوو›.

یل / yal، ـان/: *اسم.* *[ادبی]* پاڵەوان؛ دلێر؛ گورد.

یلخی / yelxî/: [ترکی] *قید.* *[گفتاری]* بەرەڵا؛ بەڕەڵا؛ وێڵ؛ وێڵەکی؛ کێفی؛ بەبێ چاوەدێری ‹یلخی بارآمدن: بەرەڵا بارهاتن›.

یلدا / yaldā/: [سریانی] *اسم.* چلە؛ شەوچلە؛ یەلدا؛ هەوەڵین شەوی زستان کە درێژترین شەوی ساڵە.

یلک / yalak/: [؟] *اسم.* سوخمە؛ سخمە؛ سیخمە؛ زوخمە؛ یەلەک؛ ئێلەک؛ ئێلەگ؛ ئێلەگ؛ ئیشلەک؛ قوتەک؛ یەل‌ماسوخمە؛ جلیقە؛ ئیشلک؛ باڵاپۆشی بێ‌قۆڵی ژنانە.

یللی تللی / yallalîtallalî/: *اسم.* *[گفتاری]* ۱. عاتڵ و باتڵی؛ بەتاڵ و قەتاڵی؛ بێکارەیی؛ پاتاڵی؛ کەتوەری؛ تراڵی ۲. وێڵی؛ بەرەڵایی.

یلوه / yalve/: *اسم.* مریشک‌ئاوی؛ جۆرێ باڵداری مەلەوانە بە سەری بچووک، جووچکی کورت، باڵی خڕ و پەنجەی بڵندەوە.

یله / yale/: *صفت.* بەرهەڵدا؛ بەرەڵا؛ وێڵ؛ ئازاد؛ ڕەها؛ بەر.

◘ یله دادن: پاڵ دانەوە؛ شان داهێلان.

یله کردن: ئازادکردن؛ بەرهەڵدا کردن؛ بەردان؛ وێڵ‌کردن.

ـ یم / îm/: *ضمیر.* ـ ین؛ ـ مان؛ ـ مێ؛ ـ ما؛ جێناوی لکاو بۆ یەکەم کەسی کۆ ‹آمدیم؛ دیدیم: هاتین؛ دیتمان›.

یمانی / yamanî/: [عربی] *صفت.* *[ادبی]* یەمانی؛ یەمەنی؛ سەر بە وڵاتی یەمەن ‹حریر یمانی: حەریری یەمانی›.

یمن / yomn/: [عربی] *اسم.* پیت؛ بەرەکەت؛ ودم؛ شکون؛ ورمێ؛ ورم؛ هورم؛ ئۆقووم؛ فەڕ و پیت؛ خێر و بەرەکەت.

◘ یمن داشتن: مبارەک بوون؛ پیرۆز بوون؛ بەودم بوون.

یمین / yamîn/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* ڕاست؛ ڕاس؛ لای ڕاست.

یمین و یسار / yamîn-o-yasar/: [عربی] *اسم.* *[ادبی]* ڕاست و چەپ؛ ڕاس و چەپ؛ چەپ و ڕاست.

ین / yen/: *اسم.* یێن؛ یەکەی پارەی وڵاتی ژاپون (یابان).

ـ ین / în/: *پسوند.* ـ ین: ۱. لە ناو، ئاوەڵناو دروست دەکا ‹آهنین: ئاسنین› ۲. لە ئاوەڵناوی هەڤیازی(صفت تفضیلی)، ئاوڵناوی باڵا (صفت عالی) ساز دەکا ‹بهترین: باشترین›.

ینگه / yenge، ـها/: [ترکی] *اسم.* پێ‌خەسوو؛ پاخەسوو؛ بەربووک؛ بەربوودی؛ بەربووری؛ بەربیک؛ بەربودی؛ بەربوو؛ بوکنی؛ پاوەوی؛ پاوەی؛ بانبارگە؛ پۆرسپی؛ بزگێلە؛ پاوەیوە؛ سەرسپی؛ ژنێ کە دەگەڵ بووکدا دەچێ بۆ ماڵی زاوا تا بووک بۆ چوونە پەردە ڕێنوێنی بکا و هەواڵی داوێنپاکیشی بێنێتەوە بۆ باوان.

ینگه‌دنیائی / yengedonyā'î/: [ترکی/ عربی] ☜ **ینگه‌دنیایی**

ینگه‌دنیایی / yengedonyāyî، ـها/: [ترکی/ عربی] *اسم.* *[مجازی]* ئەمریکایی؛ هەر کام لە خەڵکی ئەمریکا.

ـ ینه / îne/: *پسوند.* ـ ین؛ ـینە: ۱. کاڵای چێکراو لە شتێک ‹پشمینه: پەشمینە› ۲. بە بار و دۆخ یان ژێهاتیەکەوە ‹رنگینه: ڕەنگینە›.

یواش / yavāš/: [ترکی] *قید.* *[گفتاری]* هێدی؛ لەسەرخۆ؛ نەبلەز؛ ئاسپایی؛ هێدیکا؛ هێواش؛ بە ئۆخژن؛ بە ئۆقرە؛ ئەسپایی؛ ئێواش؛ سەبر؛ شێنەی؛ یەباش؛ سەبرۆکە؛ یاباش؛ بەسپایی؛ هێون؛ هێمن؛ ئارام؛ کاوەخۆ ‹یواش برو!: هێدی برۆ!›.

**یواشکی** / yavāšakî ، ـها/: [ترکی/ فارسی] *قید. [گفتاری]* هێواشـێک؛ یەواشـێک؛ یەباشـەکی؛ یەواشلـێو؛ یەواشـێوە؛ هێـواش: ١. فەسـاڵ؛ شـێنەیی؛ هێـدیکا؛ بـە ئەسـپایی؛ هێـدی؛ بەکاوەخۆ؛ لەسەرخۆ؛ بە سـەبر؛ پیـت؛ عاسـتەم؛ حاسـتەم؛ زۆرەک و دووبـەلا؛ چوولـەچوول؛ سەوری؛ بە لەسەرخۆیی؛ سـەبرۆکە؛ لەسـەرەخۆ ‹یواشکی زد روی دستم: هێواشـێک دای بـە سـەر دەستمدا› ٢. بـە دزیـەوە؛ بەپـەرێز؛ خشـکەیی؛ کولەپسـکی؛ پیتـەپیت ‹یواشکی وارد اتاق شد: هێواش چووە ناو دیوەکەوە›.

**یورتمه** / yortme, yurtme/: [ترکی] ☜ **یُرتمه**

**یورش** / yûres, yoreš ، ـها/: [ترکی] *اسم.* گـالا؛ گوژم؛ هێرش؛ هـروژم؛ هـوروژم؛ وروژم؛ وروژم؛ هـاژۆت؛ هەلمـەت؛ هەڵـمەت؛ نهێـو؛ پـەلامار؛ حەملە؛ گورمتـە؛ گـورمژ؛ گلـپ؛ گلـپ؛ شـالاو؛ تەپ؛ کار و ڕەوتی دابەڕزین؛ دابەڕزان؛ ڕاقوتـان؛ ئاژۆتنە سەر.

▣ **یورش آوردن**: هێرش هێنان؛ هروژم هێنان؛ پـەلامار دان؛ هێـرش بـردن؛ حەملـە کـردن؛ هەڵـمەت بـردن؛ هـاژۆت هێنـان؛ وروژم هاوردن؛ شالاو بردن؛ هەلکوتاندن؛ گـورمژین؛ داڕسـان؛ داڕسـکان؛ ڕاقوتـان؛ دابـەڕزین؛ دابەڕزان.

**یورغه** / yorqe/: [ترکی] ☜ **یُرغه**

**یورقه** / yorqe/: [ترکی] ☜ **یُرغه**

**یـورو** / yûro/: [انگلیسی] *اسم.* یـورۆ؛ یەکـەی دراوی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئورووپا.

**یوز** / yûz/ ☜ **یوزپلنگ**

**یوزپلنگ** / yûzpalang ، ـها؛ ـان/: *اسم.* وەرشەق؛ وەرشـەک؛ وشـەک؛ ورشـەک؛ یـوز؛ هـاس؛ تـاژپلنـگ؛ ویـز؛ هووشـنگ؛ کورەپەسـک؛ جانـەوەرێکی گوانـداری دڕندەیـە لـە تـیرەی پشیلە، لە پلنگ چکۆلەتر، زاگەبـەری ئـەفریقا و ئاسیا، بە لەشی خاڵ ـ خاڵ، سەری خڕ، دەست و پێی بەرز و باریک و یەکجار چـاوک، خێراتـرین گیانەوەری سەر زەوینە: **یوز**

▣ **یوزپلنگ آمریکایی**: جەگوار؛ جاگوار.

**یوغ** / yûq/: [ترکی] *اسم.* ١. کەڵـەوە؛ کەڵـەمە؛ کەلمـە؛ کەڵـەوک؛ هوویـە؛ هووییـە؛ چەنبـەرە؛ کەلەمەک؛ نێڵە؛ نیلـە؛ نیـل؛ جـوق؛ نـیر؛ نـیرە؛ سـیمکە؛ نێـری سـەر ملـی گـا لـە جووتـدا ٢. *[مجازی]* یەخسیری؛ کوێلەتی.

**یوگا** / yûgā/: [سنسکریت] *اسم.* یووگا: ١. ڕێبازی فەلسەفی و دینی هێندوو کە سەربەستی ڕۆح و بیر لە لێبـڕان و دەسـت بـەردان لـە داخـوازی لەش و پشتکردن لە دنیا دەبینـێ ٢. کۆمەڵـە وەرزشێک بۆ ساخی و زاڵ بوون بە سەر لەش و ڕۆحدا.

**یول** / yol/: [؟] *اسم.* وێـوڵ؛ وهـۆڵ؛ زرەمـازوو؛ دارێکی دارستانە لە دارمازوو دەکا و لە باکووری زاگروسدا شین دەبێ.

**یولاف** / yûlāf/: *اسم. [گیاەشناسی]* کـاڕام؛ کـاڕان؛ گیا لەرزانە؛ جۆشـاهی؛ یـەوەرۆمی؛ یـەوەدێوی؛ جۆی هوورچ؛ ڕووەکێ لـە تـیرەی گـەنم و جـۆ، گـەڵاکانی وەک جـۆ درێـژ و تیـژن، گوڵـەکەی هۆشەییە کە لە زۆر وڵاتاندا وەک خەلە کەڵـکی لێدەگرن.

**یومیه** / yowmîyye, yo:mîye/: [عربی] *صفت.* ١. ڕۆژانە؛ یۆمـە؛ ڕۆژانـە؛ ڕۆژبـەڕۆژ ٢. گـرۆژێ؛ گش ڕۆژێک؛ هەر ڕۆ؛ هەر ڕۆژ؛ هەموو ڕۆژێ.

**یون** / yon ، ـها/: [فرانسوی] *اسم. [شیمی]* یـون؛ ئەتۆم یان کۆمەڵە ئەتۆمێ کە بە گرتن یـان لـە دەسـتدانی ئیلکتـرۆن بـاری (+) یـان (−) دەگرن.

**یونانی**[1] / yûnānî/: *اسم.* یوونـانی: ١. /ـها؛ ـان/ هەر کام لە خەڵکی وڵاتی یونان ٢. لە زمانگەلی هێندو ـ ئوروپایی کە زۆرتر لـە یوونانـدا قسـەی پێدەکـەن ٣. ئـەلفوبێتکـەی یونـانی کـە لـە فینیقیەکانـەوە وەرگـیراوە و دوایـی بـوو بـە

سەرچاوەی لاتینی.

**یونانی**[۲]: صفت. یوونانی؛ سەر بە وڵاتی یوونان.

**یونجه** / yonce ، ـها/: اسم. وێنجە؛ یونجە؛ کەت؛ قـەت؛ کـەتی؛ یۆنجـێ؛ زەرەک؛ ئەسپسـت؛ ئەسپس؛ گیایەکی گەڵا سێبڕگەی گوڵ‌درشتی ئاوی، بنەوش یـان زەردە، تـووی دەوەشـێنن و بەرهەمی دێنن، گرینگترین ئالفی مەڕ و ماڵاتە.

**یوندار** / yondār ، ـها/: [فرانسوی/ فارسی] صفت. [شیمی] یوندار؛ خاوەن یون.

**یـونکره** / yonkore/: [فرانسـوی/ عربـی] اسـم. بۆشـاییەک کـە لـە بـەرزایی ۵۰ کیلـۆمیتر بـە دەوری زەویدا دەس پێ دەکا، تـا دەگاتـە ۵۰۰ کیلۆمیتر، ئەتوم و مولوکـوول لـەو کەشـەدا بـە چەشنی یون دەردێن.

**یونولیت** / yonolît/: [انگلیسـی] اسـم. یۆنۆلیـت؛ ماکێکی فشۆڵی سووک و سپی کە لە بەستەبەنی و بەرگرەکاریدا کەڵکی لێ وەردەگرن.

**یونیـدن** / yonîdan/: [فرانسـوی/ فارسـی] مصـدر. لازم. متعدی. ☐لازم. ۱. بە یـون بـوون ☐متعدی. ۲. بە یون کردن؛ یوندار کردن.

■ صفت فاعلی: **یوننده** (ـ)/ صفت مفعولی: **یونیده** (ـ)

**یونیـده** / yonîde/: [فرانسـوی/ فارسـی] صـفت. یوندارکراو؛ یوندار: **یونیزه**

**یونیزاسیون** / yonîzās(i)yon/: [فرانسوی] ☜ **یونش**

**یونیزه** / yonîze/: [فرانسوی] ☜ **یونیده**

**یونیفرم** / yûnîform,yonîform/: [انگلیسی] ☜ **اُنیفرم**

**یونیـوم** / yonyom/: [یونـانی] اسـم. یۆنیـوم؛ ئیزۆتۆپی تیشکدەری سروشتی توخمی توریـوم بە جرمی ئەتومی ۲۳۰.

**یویـو** / yoyo ، ـهـا/: اسـم. یۆیـۆ؛ جۆرێـک لەیستۆکی منداڵان بە شێوەی قرقرەیـەک کـە سووڕ دەخوا و بەنێکی بە دەوردا هەڵدەبێ و بان و خوار دەکا.

**ـ یه** / îyye/: پسوند. ـ ییـه؛ ـ یـه: ۱. پاشـگری نیشانەی جێگا ‹امیریه؛ امانیـه: ئەمیرییـە؛ ئەمانیـە› ۲. ـ ی؛ پاشگری نیشانەی ئایین و ڕێباز ‹امامیه؛ اسماعیلیه: ئیمامی؛ ئیسماعیلی›.

**یهود** / yahûd/: [آرامی] جمع ☜ **یهودی**[۱]

**یهودی**[۱] / yahûdî ، ـها؛ ـان؛ یهود/: [عربی از آرامـی] اسـم. جـوو؛ جوولەکـە؛ مووسـایی؛ یـاودی؛ یەهوودی؛ ئۆمەتی مووسا پەیغەمبەر(س).

**یهودی**[۲]: صفت. جوولەکە؛ یەهوودی؛ پێوەندیدار یان سەر بە یەهوود.

**یهودیـت** / yahûdîyyat/: [آرامـی/ عربـی] اسـم. مووساییەتی؛ یەهوودیەت؛ دینێ کە لـە سـێزدە چەرخ پـێش لـە مەسـیحیەت، لـە نێـو قـەومی عیبریدا و لە سەر بنـەمای پەرەسـتنی خـودای تاک پەرەی ساند و ئامۆژیـاری پێغەمبـەرەکانی (مووسـا؛ داود و...) لـــە کتـــێبی تەوراتـــدا کۆکراوەتەوە: **دین یهود**

**ییدیش** / yîdîš/: اسم. ییـدیش؛ زمانـێ کـە لـە لایەن جوولەکەی ئاڵمانەوە بـە خـەتی عیبـری نووسـراو و دوایـی بـوو بـە زمـانی جوولەکـەی ئورووپا: **یدیش**

**ییلاق** / yeylāq ، ـها/: [ترکی] اسم. هەوار؛ هەڤـار؛ هاوینـەوار؛ زۆزان؛ وار؛ ڤـار: ۱. کـۆز؛ لـەیلاغ؛ لەیلاخ؛ ئێلاخ؛ کیفسان؛ کوێستان؛ بانە؛ هاوینـە هـەوار؛ بانەمـەڕ؛ هاوینگـە؛ هاڤـینگە؛ هاڤـینگا؛ هەوارگە؛ وارگە؛ هاڤینەوار؛ هامنـەهۆ؛ کوێسـان؛ کۆساڵ؛ شوێنێ کە خێڵـی هـەوارچی هاوینـان بۆی دەچن ۲. مەڵبەندی فێنـک و خـۆش کـە هاوینان خەڵک بـۆ سـەیران ڕووی‌تێدەکـەن ❊ بەرانبەر: **قشلاق**

⊡ ییلاق کـردن: چوونـە هـەوار؛ چوونـە زۆزان؛ چوونە کوێستان؛ ئێلاخ‌کەردەی؛ هەوار لوای.

**ییلاقـی** / yeylāqî/: [ترکـی] صـفت. زۆزانی؛ خـێلاتی؛ ئێلاخـی؛ هاوینەهـەواری؛ شـیاو و تایبەتی هەواری هاوینان: بەرانبەر: **قشلاقی**

**خوێنەری هێژا !**

هەر وەک لە بەرگی یەکەم، ئەم وشە فارسیانە کە لێرەدا بە مانای عەرەبی و ئینگلیسیانەوە ڕیز کراون، ئەوانەن کە ئێمە بەرانبەرێکی پڕ بە پێستی کوردیمان بۆ نەدیونەتەوە. ئەگەر ئێوە بۆ هەر کامیان کوردیەکی ڕەسەنتان زانی، لە جێگای خۆی داینێن و بۆ ئێمەشی بنێرن تا لە چاپەکانی داهاتوودا ڕەچاویان کەین.

| فارسی | عربی | انگلیسی | کردی |
|---|---|---|---|
| جامع الشرایط : [عربی]/اسم. | جامع الشرائط | all-inclusive | |
| جانگرایی :/اسم. | – | animism | |
| جایزه‌بگیر :/اسم. | – | award-winner | |
| جبرگرایی :/اسم. | الجبرية | determinism | |
| جذبه: [عربی]/اسم. | هزّة الطرب أوالسرور | charisma | |
| جرح: [عربی]/اسم. | عملية الطرح و الحذف | mayhem | |
| جرح و تعدیل : [عربی]/اسم. | التعديل | modification | |
| جناس : [عربی]/اسم. *[بدیع]* | الجناس | homonymy; homophony | |

